عیزەدین ئیبن ئەسیر

# تەواوی مێژوو

بەرگی یەکەم

وەرگێڕانی
زاهیر محەمەد ڕەشید

پێداچونەوەی
پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. یاسین سەردەشتی

## بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر


***پێناسی کتێب***

ناوی کتێب : تەواوی مێژوو

بابەت :مێژوویی

بەرگی: یەکەم

**نوسینی: ئیبن ئەسیر**

**وەرگێڕانی: زامیر محەممەد رەشید**

تایپ: نژۆ مستەفا

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی دووەم سلێمانی ۲۰۱۰

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هەرێو عوسمان

تیراژ :۱۰۰۰ دانە

ژمارەی سپاردن ( ۱۲۵۲ ) ساڵی (۲۰۰۸) پێدراوە

# پێرست

## پێشەکی

راستیەکی بەڵگە نەویستە، هەروەك چۆن داهاتوو زادەی ئێستا و ئەمرۆیە، ئەمرۆش زادەی دوێنێی رابردووە. بە واتایەکی دی، هەر نەتەوە و گروپێکی کۆمەڵایەتی لەرۆژگاری ئەمرۆدا چییە و چ کارەیە، پشت بە هەڵ و مەرجی دوێنی دەبەستێت کە لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا چی کردووە و چ کارە بووە. بێگومان لە داهاتوویشدا چی دەکەن و چۆن دەبن، دەکەوێتە سەر ئەوەی ئێستا و دوێنێ چی بوون و چین. وردتر، داهاتوو بە گشتی، لەسەر ئەمرۆ و دوێنێ رادەوەستێت. بەوەش ئەو راستیە دەچەسپێت کەکات یەکەییکی پێکەوە بەستراو و لێك دانەپچڕاوە، تێیدا سەردەمێکی لەسەردەمێکی دیکەی جیاناکرێتەوە و هەر لێرەیشەوەیە کەبایەخی (مێژوو) دەردەکەوێت.

مێژوو بەگشتی، بریتیە لە تۆمار و یادداشتە گرنگەکانی رابردوو لەلایەن کەسێکەوە کەبەمێژوونوس ناودەبرێت. ئەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بە پێی توانا و شارەزایی و لێهاتوی خۆی، راستی ئەو رووداوانە بگێرێتەوە و قامك بخاتەسەر کات و شوێن و هۆکارەکانی روودانیان و پەیوەندیان پێکەوە روونبکاتەوە و کاریگەریان لەسەر یەك و رووداوەکانی داهاتوو نیشان بدات. ئەرکێکی ئەوتۆی مێژونوس کە تارادەیەکی زۆر گران و تاقەت پروکێنە و لە سۆنگەی مرۆڤ بوونی خودی مێژونوس، هەروەها باڵادەستی سێبەری مرۆڤ بەسەر کەرەسە خاوەکانییەوە، ئەگەری نییە بتوانێت تەواوی راستی رووداوەکانی رابردوو کوتومت وەك خۆی بخاتە بەردەست. ئەوەی هەیە تەنیا گواستنەوەی وێنەیەکی نزیکە لەرووداوەکانی رابردوو، وێنەیەکە خودی مێژونوس، لەبیر و هزری خۆیدا و بەپێی شێوازی مامڵە کردنی لەگەڵ کەرەستە خاوەکان و تێگەشتنیان وێنای دەکات.

خوێنەری بەرێز، ئەم کتێبە بەردەست، وەرگێرانی یەکێك لە گرنگترین کتێبە مێژوییەکانی جیهانی ئیسلامە کەلەبنەرەتدا ناوی( الكامل في التاريخ)ە و بە زمانی عەرەبی لەلایەن یەکێك لەبەناوبانگترین مێژونوسانی ئەو جیهانەوە کە (عزالدين کوڕی الاثير)و نوسراوە.

عێزەددین نازناوی مێژونوسێکی مەزنی موسوڵمانی سونی کوردە، لە بنەڕەتدا ناوی باوکیلحەسەن عەلی کوری ئەبی لکەرەم محەمەد کوری محەمەد کوری عەبدالکەریم کوری عەبدالواحیدە. ناوبراوی لەساڵی ٥٥٥ کۆژی/ ١١٦٠ زایینی لە جەزیرەی بۆتان کە بەجەزیری ئیبن عومەریش ناودەبرێت، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. عیزەددین کورە ناوەنجی باوکیەتی. برایەکی لەخۆی گەورەتری بەناوی (مجدالدین ابوو السعادات) و یەکێکی دیکەی لەخۆی بچوکتری بەناوی (ضیاء الدین ابوو الفتح) هەیە، کە ئەوانیش زانا و مەحەدیسە و نوسەری بەناوبانگ و خاوەن کتێبن و هەروەك عیزەدین بە (کوری الاثیر) ناسراون.

شایەنی باسە عیزەدین کەلەنێو بنەماڵەیەکی ناودار و خاوەن سامانی جەزیرەدا پەروەردە ببوو، هەر لەسەرەتاوە بایەخێکی تایبەتی لە لایەن باوکیەوە پێدراوە. عیزەددین وێرای ئەوەی هەر بە منداڵی قورئانی لەبەر کرد و بنەماکانی خوێندن و نوسین فێربوو، دوای ئەوە لە گەڵ باو ك و دوو براکەیدا بەتەواوی جەزیرەیان بەجێهێشت و رویان کردە موسڵ و لەو شارەدا نیشتەجێ بوون، دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخسا کەسەردانی مزگەوت و خوێندنگا و کۆرە زانستیەکانی موسڵ بکات و لێیانەوە فێربێت. ئەو هەر لەوێ زانستی حەدیسی لەسەردەستی هەردو زانای ناسراو (ابی الفضل عەبدوالله کوري احمد) و (ابي فرج يحيي الثقفي) خوێند. دواتر دەرفەتی چوونە حەجی قۆستەوە و سەردانی بەغدادی کرد و لەوێ سەردانی زانایانی بەناوبانگی وەك (ابی القاسم یعیش کوری صدقە الفقیە الشافعی) و (ابی احمد عەبدالوهاب کوری علی الطوسی) کرد و زانیاریان لێ فێربوو. پاشتر بۆ بەدەستهێنانی زانست و بەمەبەستی فێربوون و گەڕان بە دوای زانیاریدا، روی کردە شام و چووە قودس و زانایانی ئەوێشی بینی و دواتر گەڕایەوە موسڵ تا لەماڵەکەی خۆیدا جێگیر بێت و خۆی بۆ کاری نوسین تەرخان بکات.

دەبێ بگوترێت، وێرای ئەوەی عیزەددین لە کاتی گەڕان و سورانی بە دوای زانست و زانیاریدا، زۆربەی زانا پایەبەرزەکانی جیهانی ئیسلامی سەردەمەکەی خۆی بەسەر

کردنەوە و لێیانەوە زانستەکانی : حەدیس، فیقە، قورئان، ئوصول، فەرائز، و مەنتیق فێربووە. بەڵام ئەو تەنیا دو لە زانستەکانی هەڵبژارد و تیایاندا قوڵ بوویەوە کە زانستی حەدیس و مێژوو بوون. لە رێگای ئەو دو زانستەیشەوە ناوبانگی دەکرد. لەگەڵ ئەوەی عیزەددین کوڕی اثیر زیاتر وەك مێژوونوس ناسراوە تا موحەدیس. بەشێوەیەك کەلە پاش (الطبري) بەناسراوترین مێژونوسی موسوڵمان دەدرێتە قەڵەم. مێژونوسێك کەلەبوواره جیاجیاکانی نوسینی مێژوودا شارەزایانە ئەسپی خۆی تاوداوە. گرنگترین ئەو بەرهە مێژووییانەی تۆماری کردون بریتین لە:

١ – (التاریخ الباهر الدوله الاتباکیة) ئەم کتێبەی، باسی مێژووی دەوڵەتی ئەتابەکی دەکات کە لەلایەن (عیماد الدینی زەنگی)یەوە لە موصل لەساڵی ٥٢١ کۆچی بەرامبەر ١١٢٧ زایینی دامەزراوە. ئەو دەوڵەتی عیزەددین لە سایەیدا ژیانی دەگوزەراند.

٢ – (اسد الغابة فی معرفة الصحابة) کەلە دوبەرگ پێکدێت و تێیدا ئاماژەی بە حەوت هەزار و پێنج سەد لە یارانی پێغەمبەر (د.خ) (د.خ) و ژیان و تایبەتمەندییەکانی کردووە.

٣ – (اللباب فة تهذیب الانساب) کەباسی لە رەگەز و بنەچە و تیرەو تایەفەی خێڵەکانی عەرەب و ئاکار و شێوازی ژیان و دابەش بوون و گوزەرانیان دەکات.

٤—(الکامل فی التاریخ) کەلەدوانزە بەرگ پێکهاتوە و لە مێژووی گشتی دەدوێت. هەر لە قۆناغی ئافراندن و سەرەتای ژیانەوە تا دەگاتە ساڵی ٦٢٨ کۆچی. واتە یازدە ساڵ بەر لەمردنی کەساڵی ٦٢٩ کۆچی بەرابەر ١٢٤٣ زایینییە.

عیزەددین لە الکامل دا قسە لە جیهانی کۆن دەکات تا دەرکەوتنی ئیسلام. دواتر دێتە سەر باسی جیهانی ئیسلامی تا سەردەمەکەی خۆی. ئەو لە گێرانەوە و تۆمار کردنی

روداوەکاندا پشت بە بەدوا یەکهاتنی ساڵەکان دەبەستێت و روداوکانی هەر ساڵ بەجیا تۆمار دەکات. ئەو رێبازەی کەبە (الحولی / chronicle ) ناو دەبرێت. عیزەددین وێڕای ئەوەی لەم کتێبەدا باس لە مێژووی گشتی روداوە گرنگەکانی رابردوو دەکات کەچی لە هەمان کاتدا تا بۆی کرابێت روداوە ناوچەیی و هەرێمیەکانی پشتگوێ نەخستوە. بگرە ئاوڕی لە هەواڵەکانی کەش و ئاو هەوا و دیاردەکانی وەك: بوومەلەرزە، وشکەساڵی، گرانی، بلاوبوونەوەی نەخۆشی... هتد داوەتەوە.
شایانی باسە الکامل دەیسەلمێنێت کە عیزەددین تەنیا بە گێڕانەوەیکی ساکاری روداوەکان وگواستنەوەی هەواڵەکانی رابردوو و تۆمار کردنیان نەوەستاوە بەڵکو ئەو زۆربەی کات وەك راڤەکارێکی لێهاتوو و رەخنەگەرێکی وریا سەرنجی خۆی لەمەڕ روداوەکانی رابردوو نیشانی خوێنەر داوە و رەخنەی سەربازی و سیاسی و مۆراڵی خۆشی سەبارەت بە دیاردە مێژوویەکان هەیە. دیارە عیزەددین بە هۆی جێبەجێ کردنی هێندێك ئەرکی سیاسی فەرمی کەلەلایەن خاوەنی موسڵەوە پێی سپێردرابوو، هەروەها لە سۆنگەی ئەوەوە کەلە شەڕ و ململانێ و پەلامارە سەربازییەکانی (سەلاح الدینی ئەیوبی)دا هاوەڵی ناوبراوی کردووە. هەربۆیە ئاسانتر توانای بەسەر گێرانەوەی ئەو روداوانە و نیشاندانی سەرنج و تێبینی و رەخنە گرتن داشکاوە و لەو لایەنەوە لێهاتویی خۆی دەرخستوە. ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کەسایەتی مێژووی عیزەددین لەهەمیشەدا رون و ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا بێت. ئەوەی ئەم راستیەشی زیاتر دەرخستووە ئەوەیە، کە عیزەددین (الکاملی) بەزمانێکی پاراو و سانا و بێ گرێ و گۆڵ پێشکەش بەخوێنەران کردووە.

ئەم وەرگێڕانە کوردییەی کتێبی مێژووی (الکامل)، لە لایەن برای وەرگێڕی پێگەشتووی لاو و خوێندکاری بەرێزم کاك(زاهیر محەممەد رەشید)ەوە ئامادە کراوە و پێشکەش بە خوێنەرانی کورد و کتێبخانەی کوردی دەکرێت. ئەو کتێبەخانەی کە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانی لەبوارە جیاجیاکاندا بەگشتی و لە بواری بەرهەمی وەرگێردارو بە تایبەتی، پێویستی بە سەدانی وەك کاك زاهیر هەیە تا دەوڵەمەند بێت و بگاتە نزیك بە ئاستی کتێبخانەی نەتەوەکانی دیکەی دراوسێ و بیانی.

هەربۆیە لە لایەن خۆمەوە دەسخۆشی لە ماندو نەبوونی کاکە زاهیر دەکەم و هیوادرام بەهەمان گوڕ و تینەوە بۆ تەواو کردنی کارەکەی تێبکۆشێت و بەسەرکەوتویی تا وەرگێرانی دوابەرگی ئەم کتێبە مێژوویە بەنرخە رانەوەستێت.

پێویستە بگوترێت، کە ئەم وەرگێرانە کوردییەی (الکامل) لەسەر وەرگێرانە فارسیەکەی کراوە کە بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی بەرامبەر بە ١٩٩١ زایینی لە لایەن وەرگێری ناسراوی ئێرانی (دکتۆر سید محمد حسینی رۆحانی) بەزمانی فارسی چاپ و بڵاو کراوەتەوە. بەش بەحاڵی خۆم چ وەرگێرانە فارسییەکەی دکتۆر رۆحانی و چ وەرگێرانە کوردییەکەی کاکە زاهیر بەکارێکی سەرکەوتووانە دەزانم. داواشم لەخوێنەران و شارەزایانی زمانی کوردی بەرێز هەیە کە پاش چاپ کردنی ئەم کارە، بابەتەکە بە وردی بخوێننەوە و هەر کەم و کورییەکی زمانەوانی تێدابێت، سەرنج و تێبینی خۆیانی لەسەر بڵاو بکەنەوە تا کاکە زاهیر بەسوپاسەوە سودیان لێ ببینێت و لە وەرگێرانی بەرگەکانی داهاتووی ئەم کتێبە لەبەرچاویان بگرێت. لەگەڵ هیوای سەربەرزی و تەندروستی بۆ هەموو<وان...

پرۆفیسۆری یاریدەدەر. دکتۆر یاسین سەردەشتی

٢٥ ی خاکەلێوە ٢٧٠٧ی کوردی

سلێمانی

## پێشەکی

سوپاس بۆ خوای کۆن شیاوە کەژیانی سەرەتایی نییە. گەورە و هەمیشەییە و لەبەر ئەمە، وەك ئەو، کۆتایی نییەو بوونی ناکامی نییە. پاشای راستین و لەسەر ئەم بنەمایە زانایی و فرمزانی هیچ کات ناتوانن هەستی پێبکەن. توانایە و لەبەر ئەمەهەمووی ئەوەی لە گەردوندایە، نیشانەیەك لەتوانایی بێ کۆتایی ئەوە. پیرۆزە و لەبەر ئەمە روداوەکان بەدەوروبەری بارگاکەی ناگەن. پاك لەگۆرانکارییە. کەواتە لەو – جگە لەو—ناتوانێت رزگاری بێت. سورێنەری ئافرێنراوەکان لەنێوان هەلگرتن و دابەزاندن و بلأوکردن و تێکچرژاندن و سەقامگیر کردن و تێك شکاندن و مراندن و زیندو کردن و بەختەوەرکردن و لەرێدەرکردن و رێزدار کردن و بێ رێز کردنە. هەر کەسێك بیەوێت، سەروەری و پاشایەتی پێدەبەخشێت و لەهەر کەسی بووێت، وەریدەگرێتەوە. چاکە لەدەستی ئەودایە و بۆ هەموو کارێك بەتوانایە. لەناوبەری رۆژگارە کۆنەکان و خەلکانی پێش. هەر بورج و قەلا و دژێکیان دروست کرد لەبەرامبەر توانایی ئەو پەنای نەدان.(( ئێستا ئایا هیچ کام لەوان دەبینی و یا ئاواز و جوولەیەك لەوان دەبیستی؟ مریم / ١٩/ ٩٨)). سوود و زیان بە دەست ئەوە و ئافراندن و کار. گەورەیە خوایەك خواوەندی جیهانیانە. ئەو لەبەر ئەو بەخشینانەی پێی بەخشیوم دەپەرستم و بۆ ئەو تواناییەی بەهەر کام لە خەلکانی داوە، رێزی لێدەگرم. سلأو و درودی بێ کۆتایی بۆ پێغمبەرەکەی دەنێرم کەگەورە و سەروەری عەرەب و عەجەم بوو و نێردراو بۆ هەموو خەلکان. سلأو لەبنەمالە و هاورێکانی کە ئالأی رێنیشاندەر بوون و چرا لەناو تاریکی. درودی خوایان لێبێت و لەبەرامبەر هەموویان سەری رێز و کورنوش دادەنەوێنم.

بەلأم دواتر، بەردەوام خوازیاری خوێندنەوەی کتێبە مێژوویەکان بووم و دەمویست ناوەرۆکیان بزانم و هەست بەروداوە ئاشکرا و شاراوەکانیان بکەم. تامەزرۆی ئەو ئەزمون و زانست و فەرهەنگانە بووم کە لەناویاندا حەشار درابوون. کاتێك تیایدا رۆچوم لەگەل خواستەکەی خۆم بەناسازگارم بینی.

دەستەیەك ڕێگاكانی مێژوو نوسین تا قوڵایی دەپێون و درێژدادڕی دەكەن و دەستەیەك لەبەر چڕوپڕی زیانی پێدەگەیەنن. لەگەڵ ئەمەیشدا زۆربەیان روداوە گرنگ و گەورەكانیان نوسیوە.

زۆربەیان سەرقاڵی كارە ورد و بێ بەهاكان بوون كە گرنگی پێنەدانیان باشتر و نەنوسینیان شیاوتر بوو.. نمونەیەك لەوان دەیوت: سەیر و سەرسوڕهێنەرە، تاقیكەرەوەی بەرد و شایەنی بەلابردن فەرماندا و پەیمانەیەكی لەبەهایان زیاد كرد، ڕێزیان لەو گرت و ئەمیان سووك.)) هەر كەسێك تا ڕۆژگاری خۆی مێژووی نوسی و دوای ئەو یەكێتر هات و بۆ ئەو پاشكۆیەكی لەخۆی بەجێهێشت و روداوە تازەكانی دوای مێژووی ئەوی زیاد كرد. ئەوەی ڕۆژهەڵاتی بوو روداوەكانی ڕۆژئاوای لەبیر كرد و ڕۆژئاواییەكان لەڕۆژهەڵات شتێكی ئەوتۆیان نەنوسی. لەبەر ئەمە كاتێك لێكۆڵەر دەیویست نوسراوێكی مێژووی بخوێنێتەوە، پێویستی بە چەندین بەرگ و كتێبی زۆربوو و دەیبینی دەستەیەك لەبەر كەم نوسین زیانیان لە مێژوو داوە و هەندێ لەبەر درێژدادڕی بوونەتەهۆی ئازار و رەنجانی.

## (( چۆنییەتی نوسین ))

کاتێك بەم شێوەم بینی دەستم بە نوسین کتێبێکی مێژووی و گشتگیر لەبارەی بەسەرهاتی ژیانی پاشاکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و نێوانیان کرد تا بۆمن یادداشتێك بێت لەترسی لەبیرکردن بەردەوام لێی بروانم و رووداوەکان لەسەرەتایی رۆژگارەوە ئاماژە پێبدەم.

ئەم بەسەرهاتانە بەردەوام دەبن و یەکێك درێژە بەرێگای ئەویتر دەدات. ئەم زنجیرە تا مردنی خۆمان درێژەی دەبێت.

لەگەڵ ئەمەیشدا ناڵێم لێرەدا هەموو رووداوە پەیوەندیدارەکان بە مێژووم زەق کردۆتەوە چوونکە ئەوەی لە موسڵە بەناچار لە دەست راگەشتن بەوەی لە قوڵای رۆژهەلات و رۆژئاوایە دوور دەکەوێتەوە. بەلام دەڵێم لەم کتێبەدا ئەو شتانەم کۆکردۆتەوە بەتەنیا لەهیچ کتێبێکدا کۆنەکراوەتەوە. هەر کەس لێی بروانێت راستی ئەم وتەی بۆ دەردەکەوێت و ئەندێشەی تری نابیت. من کاری خۆم لەکتێبی گەورەی ئیمام باوکی جەعفەری تەبەری دەست پێکرد چوونکە ئەم کتێبە پاڵپشتێکە و هەمووان پشتیان پێ بەستووە و لەکاتی ناکۆکی بەڵگەی لێ دەهێننەوە. هەموو بەسەرهاتەکانم وەك گەوهەرێك لەناو بەرهەمەکەی خۆمدا دانیشاند و زیانم بە هیچ نەگەیاند. ئەو لەبارەی زۆربەی رۆوادوەکان چەندین گێرانەوەی جیاوازی ئاماژە پێداوە کەهەرکام هاوشێوەی پێشوترەکەیەتی یا لەو کەم بایەختر. لەناو بەرهەمەکەی ئەو گرنگیم داوە بەگشتگیرترین گێرانەوە و کەم و کوڕیەکانم لەشوێنەکانیترەوە پڕکردەوە. هەر شتێکم لەشوێنی خۆیدا نوسی و لەم رووەوە یەك رووداو بە جیاوازی شێوەکانی گێرانەوەی، هاوشێوە و هاوناهەنگ لەناو دەرهات و ئەمە ئەو شتەیە بە جوانی لەم کتێبەدا دەیبینن.

کاتێك خوێندنەوەی ئەو کتێبەم تەواو کرد، مێژووە ناودارەکانیترم خوێندەوە و لەناو ئەوان ئەوەی لەمێژووی تەبەری خوێندبوومەوە، گشتگیرترم کرد. هەر شتێکم لەشوێنی خۆیدا دانا جگە لەوەی لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ)ی خوا بوو

چوونکە لێرەدا هیچم لەسەر وتارەکانی تەبەری زیاد نەکرد مەگەر ئەوەی زیاد کردنەکە رونکردنەوەیەکی پێویست بووایە. هەروەها ئەوەی بێژەرەکەی لەگێرانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆی بەهەڵە وتن بەراوەرد نەکردبێت. لەمبارەوە باوەڕم پێکرد چوونکە ئیمامێکی قایم کار و راست کردارە و لەروانگەی زانست و راست باوەڕی و راست بێژی، راست کارە. جیاواز لەوەیش، لەمێژووە ئاماژە پێدراوەکان و کتێبە ناودارەکان تەنیا گێرانەوەم لەکەسانێکەوە هێناوەتەوە کە راست وتار بوون و لەنوسینی کارەکانیان راست کردار. هیچ کات وەك کەسێك نەبووم لەتاریکی شەو هەنگاو هەڵبگرێت یاگەوهەرو لم تێکەڵ بکات. مێژوونوسانم بینیوە یەك روداو لەماوەی چەند ساڵێکدا دەهێننەوە و لەهەر مانگێك بەشێکی دەگێرنەوە و لەبەر ئەمە روداوەکە پچڕپچڕ دەردەکەوێت کە شتێکی لێ هەڵناکرێت و جگە لە قووڵ روانین و قووڵ تێفکرین تێگەشتنی ئەگەری نابیت. لەسەر ئەم بنەمایە یەك روداوم لە یەك شوێندا گێراوەتەوە و ئاماژەم بەوە داوە هەر بەشێك لە کام مانگ و ساڵدا رویداوە. لە نوسراوەکەی مندا هەموو روداوەکان یەك لەدوای یەك و هاوئاهەنگ و بەردەوام هاتون و هەرکام درێژەی ئەویتریان گرتووە.

لەهەر ساڵێك بۆ هەر رووداوێکی تایبەت و ناودار گێرانەوەیەکی تایبەتم ئاماژە پێداوە. لەبارەی ئەو روداوە بچوکانەی بەرگەی گێرانەوی جیاوازیان نەدەگرت ئەم رێگەیەم گرتەبەر کەبۆ هەموویان گێرانەوەیەکم لە کۆتایی هەر ساڵدا ئاماژە پێدا و لە ژێر ئەم ناونیشانەدا دامنا(( بیرەوەری چەندین روداویتر)). ئەگەر کەسێکم ناوبردووە کە لەسوچێکدا پاشایەتی کردووە یا لەشوێنێکدا شوێنکەوتەیی هەبووە و رۆژگاری درێژەی نەخایاندووە، هەموو گێرانەوەی ژیانیم لەسەرەتا تا کۆتایی لەسەرەتایی کارەکەیدا هێناوە چوونکە ئەگەر بەسەرهاتەکانی ئاوا کەسێك لەشوێنە جیاوازاکاندا بلآوببێتەوە بەهۆی زانیاری کەم، ناسینەوەی ئەگەری نابیت. لەکۆتایی هەر ساڵدا باسی بیرمەند و زانست خواز و زاناکانم کردووە کەلەو ساڵەدا مردوون. ناوە هاوشێوەکانم کەلەنوسینە جیاوازەکان بەشێوەی جیاواز دەخوێنرێنەوە و لە زمانی خەڵکی هەر شوێنێك روخسارێکیتر بە خۆیان دەگرن بە رونکردنەوەی یەك یەکی پیتەکان نوسی تا خوێنەر لە ئەعراب و نوقتە دانان بێ نیاز بێت.

کاتێك پێشینەیەکم کۆکردەوە، رۆژگارێکی درێژ، لەبەر ئەو رووداوانەی تازە بە تازە دەگەشتن و ئەم پچڕانانە جۆراوجۆر و یەك لەدوای یەك بوون، پشتم تێکردن چوونکە ناسینی من لەم جۆرە کارە گەشتبوویە ئاستی گەشە سەندن و کامڵی. ئەو کات دەستەیەك لە برادەران و فەرهەنگ ناسان و هونەر پەروەران لەهاوڕێیان— کە هاودەمی لەگەڵ ئەوان بە دوورترین دیمەنەکانی بێ نیازی خۆم دەزانم و ئەوان بە رێزداترین و بەبەهاترین هاودەمەکانی خۆم هەژمار دەکەم— داوایان کرد لەمنی ببیستن تا بتوانن لەزمانی من بیگێرنەوە. من داوای لێبووردنم کرد کە کارەکەم بە نیوە ناتەواوی بەجێهێشتوە و هێشتا کۆتاییم پێنەهێناوە چوونکە بەسەر پێشنوسەکەیدا نەچوومەتەوە و کەم و کوڕی و هەڵەکانیم نەگرتووە و هەروەها ئەوەی پێویستی بە سڕینەوە و لەناو بردن بووە، نەمکردووە. هاتو چۆی ئەوان رۆژگارێکی خایاند و بەردەوام خوازیار بوون و لەپشت تێنەکردنی من سوور. ئەوان پێش کۆتایی و پیاچوونەوە دەستیان بە بیستنی کرد. لە گەڵ ئەوەی خوێندنەوە و پیاچوونەوە بەهێزبوو و سڕینەوەی ئەوەی دەبووا نەنوسرابا، لەشوێنی خۆی. مەبەستی بەنەنجام گەیاندنی سست و ناتەوانی ئاشکرا بوو چوونکە من سەرقاڵی کاری تربووم کە رێگە چارەم لێی نەبوو، هاورێ و پشتیوانم نەبوو. هەروەها ئەو خەمانەی یەك لەدوای یەك دەگەشتن و ئەو گرفتارییە گیانبڕانەی لەیەك نەدەپچڕان. ئێستایش نیشانەی بێ میهری و گیرۆدەی ناتەوانیم و ناڵێم وەك تیژپێکان رێگە دەبڕم.

کار بەم شێوە بوو تا یەکێك دەرکەوت فەرمانبردن لەو بوو بە ئەرکێك و لایەنگیری کردن لە دەستوورەکانی هاوشێوەی دەستورەکانی خوا. کەسێك لەپێشیە گرانباییەکان بەهاتنە سەرکاری ئەو چرۆیان کرد و رۆحە ئەزانییەکان بەپشت تێکردنی ئەو لەوان جیاجیا. کردەوە رێزدارەکانی زیندوو کردەوەو بەرگێکی تازەی پۆشاندن دوای ئەوەی ئێسقانەکانیان پووکا بوو. کەسێك دادپەروەری و بەخشندەیی هەموو فەرمانبەرانی گرتەوە و بەخشندەیی سەرانسەری دنیای داپۆشی. سەروەری ئێمە پاشای میهرەبان، زانای خوایاری بەختەوەر، مانگی چواردەی دین راستەکان، کۆڵەکەی ئیسلام و موسوڵمانان، زیندوو کەرەوەی دادپەروەری کەهیوادارم دەوڵەتی بەردەوام و بەخت و

شانسی بێ کۆتایی.

لەم کاتەدا درەنگ کردنم بە رەوا نەبینی و کراژی لەش پەروەریم فڕێدا. مرەکەبم ئامادە کرد و پێنوسم بەهێز. ووتم کاتی چوستی و چالاکییە. کەواتە ئەی سەمەندی تیژ پێی من، تیژ بڕۆ. بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کتێبەم کردە گەورەترین خواستی خۆم و دەست بەکاربووم. گەر خوا کارێکی بوێت، بزوێنەرەکانی ئامادە و رێگا تەخت دەکات. لەبەر ئەمە بەخێرایی بەدواداچوونم بۆ بەئەنجام گەیاندنی کرد و ئەمە مایەی سەرسورمانە کەدواکەوتوو بیەوێت پێش هەمووان کەوێت. خۆم کردە نیشانەی تیری سەرکۆنەکەران و گیرۆدەی وتاری پڕتانەی لۆمەکەران. باس لەسەر ئەوەیە ئەگەر رەخنەگران بیانەوێت رێگە بۆ نووسینە پاکەکان بەدەست بێنن و بیرەوەرییەکان بیانەوێت کۆکراوەیەکی رازاوە فێربن کەچەندین جار چاکسازی خوێندنەوەی بۆ کراوە وکۆکردنەوە و هەڵەگیری بەردەوام ئەنجام دراوە، رێگەی ئەوان بەرەوە کتێبێك خاڵی لەم رازاندنەوانە خۆشترە و کارکردیان شیاوترە. دان بەوەدا دەنێم بەردەوام کەم وکوڕیم هەبووە و ناڵێم وتەیەکی ناراست بەهۆی لەبیرچوونەوە کەوتە سەرکاغەز. بەراشکاوی ئاگادارتان دەکەم ئەوەی نایزانم لەوەی دەیزانم زۆر زیاترە.

ناوێکم لێنا لەگەڵ ماناکەیدا یەك بگرێتەوە: الكامل في التاريخ

## (( سودەکانی مێژوو نوسین ))

زۆرکەسم بینیوە بانگەشەی زانست و زانیاریان دەکرد و خۆیان بە بیرمەند لەزانست و مێژوونوسین هەژمار دەکرد. ئەوان مێژوویان سووك دەکرد و بەکەمیان دەزانی و بە قسەی هەڵیت و پڵیتیان دادەنا و پشتیان تێدەکرد. گومانیان وابوو بەرزترین سوودی مێژوو رۆشتن بەرەو ئەفسانە و بەسەرهاتەکانە و ئەنجامەکەی ئاگاداربوون و زانیاری لەبارەی چیرۆك و وتووێژی شەوانەیە. راستە، ئەمە کاری کەسێکە لەناوك بەتوێکڵ بەسەندە بکات. بەڵام کەسێك خوا سروشتێکی راستی پێبەخشی بێت و بەرێگەی راست رێنوێنی کردبێت، دەزانێت مێژوو سودی زۆرە و بەرهەمەکانی ئەم دنیایی و ئەو دنیایی زۆر و بێ ژمار. هەنووکە ئێمە هەندێك لەم سوودانە کەبۆمان روون بۆتەوە دیاردەخەین و ناسینی سوودەکانیتر بۆ خوێنەری بەرێز بەجێدێڵین.

## (( سوودەکانی ئەم دنیایی مێژوو ))

یەکێك لەسوودەکانی ئەم دنیایی مێژوو ئەوەیە بێ گومان مرۆڤ هەمیشە زیندوبوونی خۆش دەوێت و بەباشی دەزانێت لەژماری زیندووان هەژمار بکرێت. خۆزگە دەمزانی: جیاوازی چییە لەنێوان ئەوەی خۆی دوێنێ بینیوەتی یا بیستوویەتی لەگەڵ ئەوەی لەکتێبێکی گشتگیری بەسەرهاتی پێشینیان و ژیانی رابردووان خوێندبێتی؟ ئەگەر ئەمانە بخوێننەوە وەك ئەوە وایە ئەو کەسە لەگەڵیاندا هاورۆژگار بووبێت و کاتێك لێیان ئاگادار بێت، وەك کەسێکە بووبێتە هاودەمیان.

یەکیتر ئەوەی کە: پاشاکانی رۆژگاری ئێمە و پاشاگان، کاتێك مێژوو دەخوێننەوە و شێوەی کاری زاڵمان و ستەمکاران بەجوانی و بەنوسراوی لەکتێبەکاندا دەبینن کە خەڵك لە وتار و زمانی یەکتری دەگێرنەوە و داهاتووان لە رابردووان بەسەرهاتی زۆر باس دەکەن و کاتێك دوواهاتەکانی وەك ناوزڕان و لەناو بردنی خەڵك و وێران کردنی شارەکان و بەفیرۆچوونی سامانەکان و تاریکی رۆژگارەکان ببینن، کارەکانی خۆیان بە قێزەون هەژمار دەکەن و پشتی تێدەکەن. کاتێك شێوەی ژیانی فەرمانڕەوا دادپەروەرەکان ببینن و ناوی خۆشی ماوەی ئەوان دوای خۆیان بدۆزنەوە و بزانن

لەرۆژگاری ئەوان شارو ولآتان ئاوەدان و سامانەکان روو لەزیادبوون بووە، بەچاکی دەزانن رێچکەی ئەوان بگرنە بەر و سووردەبن لەسەری و هەموو شتێکی ناسازگار لەگەڵیا لەناو دەبەن. ئەمە زیاد لەبەدەست هێنانی ئەو بیروبۆچوونە راستانەیە کەبەهۆیەوە زیانی دوژمنان لەخۆیان دوور دەخەنەوە و لەهەڵدێرەکان رزگاریان دەبێت و خەزێنەی گرانبایی شارەکان و پاشەکەوتی بێ کۆتایی ولآتەکان راست و دەست لێنەدراو دەپارێزن. ئەگەر تەنیا سوودی مێژوو ئەمە دەبوو ئەم شانازییە بۆی بەسەندەیە.

یەکێکیتر ئەزموونەکان و ناسینی روداوەکان و دوواهاتی کارەکانە چوونکە هیچ کارێك رونادات مەگەر ئەوەی لەرابردوودا پێشینییەکی هەبێت یا هاوشێوەی ئەوە رویدابێت. لەم رێگاوەیە خۆی زیاد دەبێت و لایەنگیری کردنی دەبێتە شیاو. ئەو بێژەرە خۆش وتویەتی:

| | |
|---|---|
| رأيت العقل عقلين | فمطبووع و مسموع |
| فلا ينفع مسموع | اذا لم يك مطبووع |
| كما لاتنفع الشمس | و ضوء العين ممنوع |

واتاکەی: خۆم بە دوو شێوە بینی— گونجاو و بیستراو. ئەگەر کەسێك ئاوزێکی گونجاوی نەبێت بیستن بەکاری ناخوات. وەك چۆن ئەگەر کەسێك سۆمای چاوی نەبێت تیشکی هەتاو سوودی پێناگەیەنێت.

خواستی ئەو لەئاوز سەرچاوەی گرتووە، ئاوز سرشتێکە خوا بەمرۆڤی بەخشیوە و ئاوز، بیستراوی ئەو ئەزمونانەیە ئاوزی سروشتی پێ زیاد دەبێت. ئەم وتەبێژە لەرێگەی فراوان کردنی درێژەی قسە و رێزگرتنی ئەزموون، بەئاوزێکی جیاوازی زانیوە و گەرنە یەکیشیان زیادبوونیکە لەیەکم ئاوزدا بەدەست دێت.

یەکیتر رازاندنەوەمیەکە مرۆڤ لەرێگەی خوێندنەوەی مێژوو بەدەستی دێنێت و لەکۆر و کۆبوونەوەکان بەبیرهێنانەوەی زانیارییە مێژوویەکانی خۆی و گێرانەوەی شتی تازە خۆی دەرازێنێتەوە و گوێ و دڵە بیسەرەکانی خۆی خوازیار بەخۆی دەکات. دڵەکان ئەوەی ئەو دەیدات و وەری دەگرێت بەچاك دەزانن و ئەوەی بەبیری دێنێتەوە بەجوان.

## (( سوودەکانی ئەو دنیایی مێژوو ))

بەڵام سوودەکانی ئەو دنیایی بەم شێوەیە: بیرمەندی فرمزان کاتێك لەمێژوودا ڕۆدەچێت و سەروژێربوونی خەڵك بەدەست جیهان ببینێت و بەدبەختییە یەك لەدوای یەکەکانی گەورەکان بدۆزێتەوە کەچۆن ڕۆژگاری گرژ و مۆن، گیان و پاشەکەوتەکانی ئەوانی بەتالان برد و ناوز و گەورەیی ئەوانی بەفیڕۆدا و هیچ خاوەن پلە وپایە و هیچ بێ پایەیەکی نەهێشتەوە و هیچ دارا یا نەدارێك لەزیانەکەی ڕزگاری نەبوو، دنیا بەکەم دەزانێت و پشتی تێدەکات و ڕوودەکاتە توێشوگرتن بۆ جیهانێکیتر و خوازیاری ماڵێکی بەردەوام دەبێت کە هیچ کام لەم کەم و کوڕیانەی نییە و داهاتووان لەم زیانانە بەدوورن.

ئەگەری هەیە بێژەرێك بڵێت: هیچ خوێنەرێکی مێژوویم نەبینیوە پشت لەدنیا بکات و ڕووبکاتە ئەو دنیا و پێگە بەرزەکەی. خۆزگە دەمزانی ئایا ئەم بێژەرە دەستەیەك لەخوێنەرانی قورئانی— کە سەروەری هەموو ئامۆژگارییەکان و پاراوترینی هەموو وتەکانە— نەبینیوە کەلەخوێندنەوەی قورئان بەدوای ئەم کاڵا کەمەدا دەگەڕێن و بەسەندەی پێدەکەن؟ بەڵێ، دڵی خەڵك خوازیاری سوودە زوو بەدەست هاتووەکانە و چارەسەری ئەمە ناکرێت.

یەکێتر لەسوودەکانی ئەو دنیایی مێژوو، ڕازاندنەوە بەلەخۆبووردویی و بەرگەگرتنە کەلە عادەتەکان پەسندیان کردووە چوونکە کاتێك بیرمەند دەبینێت هیچ پێغەمبەر (د.خ) و پاشایەکی گەورە لەزیانی دنیا ڕزگاری نەبوو و تەنانەت هیچ کەس تیایدا نەحەوایەوە، دەزانێت بەویش دەگات کەبەوان گەشت و ئەو هەمان تێدەگات کەئەوان تێی گەشتون.

و هل انا الا من غزية ان غوت          غويت و ان ترشد غزية ارشد

واتاکەی: ئایا من یەکێك لەبنەماڵەی غزیەم؟ ئەگەر غزیە گومرا بێت منیش گومرا و لەناو دەچم و ئەگەر ڕزگاری بێت منیش ڕزگارم دەبێت.

بۆ ئەم زانستەیە بەسەرهاتی زۆر لەقۆرئاندا هاتووە: خوا دەفەرمێت ((ئەم بەسەرهاتانە ئامۆژگارییە بۆ کەسێك کەدڵی بەئاگا بێت و گوێ بگرێت و شایەتی تێگەشتنی خۆی بێت ( ق/ ٥٠/ ٣٧).)) ئەگەر ئەم بێژەرە گومان دەکات خوای گەورە

ئەم بەسەرهاتانەی لەرێگەی ئەفسانە و وتووێژی شەوانە گێراوەتەوە، دەبێت بزانێت درێژەدەری گومانە گومڕاکانی خۆی بووە و زۆر کەس لە – بەپێی وتەی قورئان— لەبارەی داستانەکانی قورئان – پێشینان دەڵێن: ((ئەمانە ئەفسانەی پێشینانە کە پێغەمبەر (د.خ) (د.خ) نووسیویەتی و لەبەرەبەیان و کاتی شەو بۆی دەگێرنەوە و پێی دەدەن)) (فرقان/٢٥/٥).

لەخوام دەوێت دڵێکی بیرمەند و زمانێکی راست وتارمان پێببەخشێت و لەسەر رێگەی راست دامانێت کە ئەو بۆ ئێمە بەسە و چاك سەروەرێکە.

## کاتێك مێژوونوسین لە ئیسلام دەستی پێکرد

دەڵێن کاتێك پێغەمبەر (د.خ) گەشتە مەدینە، فەرمانی بە مێژوونوسیندا. وتاری راست و ناودار لەم بوارەدا ئەوەیە کە عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی مێژوونوسینی دا. هاندەری ئەم کارە بەشێوەیەك بوو باوکی موسی ئەشعەری بۆ عومەر کوڕی خەتابی نوسی: نامەکان لەتۆ بەئێمە دەگات کەبەرواری تێدا نییە. لەم کاتەدا عومەر خەڵکی بۆ راوێژ کردن لەگەڵ خۆی کۆکردەوە. یەکێك وتی: هەڵبژاردنی پێغەمبەر (د.خ) (د.خ) بۆ پێغەمبەر (د.خ)ی بکە دەسپێکی مێژوو. دەستەیەکیتر پێشنیاریان کرد کۆچی پێغەمبەر (د.خ) (د.خ) لەمەککە بۆ مەدینە بکاتە دەسپێکی مێژوو . عومەر کوڕی خەتاب وتی : کۆچی پێغەمبەر (د.خ) لەمەککە بۆ مەدینە دەکەینە دەسپێکی مێژوو چوونکە کۆچی ئەو راستی لەکەژی و چەوتی جیا کردەوە. شەعبی ئاماژەی بەم گێرانەوەیە داوە.

مەیمون کوڕی میهران دەڵێت: لای عومەر کوڕی خەتاب بەڵگەیەکیان هێنایەوە کەبەروارەکەی مانگی شەعبان بوو. ئەو وتی: ئەمە کام شەعبانەیە؟ شەعبانێك کەدێت یا ئەوەی تیایداین؟ ئەو کات بەهاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ)ی وت: بناغەی شتێك بۆ خەڵك دابرێژن، رۆژ و مانگەکان بناسنەوە. دەستەیەك وتیان: لەسەر بنەمای مێژووی رۆمەکان بنوسن چوونکە ئەوان رۆژگاری زوئەلقەرنەین بەسەرەتا و دەسپێکی مێژوو دەزانن. عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەمە پێی دەچێت. وتی: لەسەر

بناغەی مێژووی ئێرانییەکان بینوسنەوە. پێیان وت: لەئێران هەر کاتێك پاشایەك دێتە سەرکار مێژووی رۆژگارەکەی پشت گوێ دەخەن. ئەوکات بڕیاریاندا بزانن پێغەمبەر (د.خ) چەندە لەمەدینەدا ماوەتەوە. بیریان کردەوە و بەدە ساڵیان خەملاند. مێژوویان لەکاتی کۆچی پێغەمبەر (د.خ) نوسی. محەمەد کوڕی سیرین دەڵێت: پیاوێك هاتە لای عومەر کوڕی خەتاب و وتی: بناغەی مێژوو دارێژن. عومەر کوڕی خەتاب وتی: مێژوو چییە؟ وتی: شتێکە عەجەمان دەینوسن و دەڵێن لەفلان ساڵ و فلان ساڵ ئاوا کرا و ئاوا بوو. عومەر کوڕی خەتاب وتی: کارێکی باشە. بناغەی مێژوویان دارشت و هاودەنگ بوون کۆچی پێغەمبەر (د.خ) ببێتە دەسپێکی مێژوو . . ئەوسا وتیان: لەکام مانگەوە؟ دەستەیەك وتیان: لەمانگی رەمەزان. وتیان: لە (محرم) باشترە چوونکە (محرم) کاتی گەڕانەوەی خەڵکە و مانگێکی حەرامە. هەموویان دەنگیان لەسەر ئەو مێژووە دا. سەعید کوڕی موسەییب دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب خەڵکی کۆکردەوە و وتی: مێژوو لەچ رۆژێکەوە بنوسین؟ علی کوڕی ئەبی تالیب وتی: لەکۆچی پێغەمبەر (د.خ)ی خوا و هاتنەدەرەوەی لەوڵاتی بتپەرستان. عەمرۆ کوڕی دینار دەڵێت: یەکەم کەس مێژووی نوسییەوە (یەعلی کوڕی ئومەییە)بوو کەلە یەمەن دەژیا.

## مێژووی عەرەب پێش ئیسلام

بەڵام پێش ئیسلام، مناڵەکانی ئیبراهیم لەخستنی ئیبراهیم بۆ ناو ئاگر تا بناغە دارژتنی ماڵی خوا لەسەر دەستی ئیبراهیم و ئیسماعیل مێژوویان دەنوسییەوە. ئەوکات مناڵەکانی ئیسماعیل لەبناغە دارژتنی ماڵی خوا مێژوویان دەنوسییەوە تا بڵاوەیان لێکرد. کار بەم شێوەبوو کەهەر کات دەستەیەك لە ((تهامە- تێهامە)) دەرۆشتنە دەر، رۆشتنە دەرەوەی ئەوانیان دەکردە دەسپێکی مێژوو. ئەوانەی لە(تهامە) دەمانەوە، لە رۆشتنە دەرەوەی ((سەعد، ئەهد و جۆهەینە)) مناڵەکانی زەید لەتهامە مێژوویان دەنوسییەوە تا (کەعب کوڕی لۆئەی) مرد و ئەوکات لەمردنی ئەو تا ((ساڵی پیل—فیل)) مێژوویان دەنوسیەوە.

ئەوسا مێژووی پیل بەردەوام بوو تا عومەر کوڕی خەتاب لەساڵی حەقدەیەم یا هەژدەیەم کۆچی کردە دەسپێکی مێژوو. پێشتر هەر هۆزێك لەهۆزەکانی عەرەب لەسەر بنەمای رووداوێك لە روداوە گرنگەکان مێژوویان دەنوسیەوە چوونکە مێژوویەکی گشتگیریان نەبوو. لەبارەی ئەمەوەیە یەکێکیان وتویەتی:

ها انا ذا أمل الخلود و قد ادرك عقلي مولدي حجرا"

جوعدي وتویەتی:

فمن يك سائلا عني فأني من الشبان ايام الختان

یەکێتر وتویەتی:

و ما هي الا في ازار و علقة بغار من همام علي حي خثعما

وەك دەبینرێت هەر یەك لەمانە رووداوێکی ناوداریان کردۆتە دەسپێکی مێژوو بۆ خۆیان هەرچەندە ئەگەر ئەوان مێژوویەکی گشتگیریان دەبوو گیرۆدەی چەندلایەنی نەدەبوون. و خوا زاناترە.

## وتار لەبارەی زەمان

زەمان هەمان کاتژمێرەکانی شەو و رۆژە کەهەندێ کات بە درێژی و کورتی هەر یەك لەم دوانەیش دەوترێت. عەرەبەکان دەڵێن ((اتيتك ايام الصرام)) کە زەمانی صرام لێرەدا بەمانای کاتی سەرامە، یانی کاتی هەڵگرتنەوەی میوەی خورما هاتمە لای تۆ. هەروەها دەڵێن: ((اتيتك ازمن الحجاج اميرا)) بەم شێوەیە زەمان کۆدەکەنەوە و خواستی خۆیان بەم شێوەیە دەگێرنەوە کە هەر کاتێك لەکاتەکانی فەرمانرەوایی ئەو بەشێك لەرۆژگارەکان بووە.

## وتار لەبارەی سەراسەری زەمان لەسەرەتا تا کۆتایی

خەڵك لەبارەیەوە بەجیاوازی قسەیان کردووە. کوڕی عەباس لەگێرانەوەیەك کە((سەعید کوڕی جوبەیر)) لەوی گێراوەتەوە، وتوویەتی: درێژاییەکەی حەوت هەزارساڵە. ((وەهب کوڕی مونەبە)) وتوویەتی درێژایی زەمان شەش هەزار ساڵە. ((باوکي جعفرمحمد کوري جريري طبري)) دەڵێت وتەی راست لەمبارەوە ئەوەیە عەبدوالله کوڕی عومەر لە پێغەمبەر (د.خ)ەوە گێراویەتیەوە، فەرموویەتی: ((رۆژگاری ئێوە موسوڵمانان لەبەرانبەر پێشینیان بە ئەندازەی نوێژێکیتر تاکاتی ئاوا بوونی هەتاوە)). ئەم مانایە ((ئەنس و باوکی سەعید)) ئاماژەیان پێداوە بەم جیاوازییە کەئەوان لەجیاتی دەستەواژەی ((تاکاتی ئاوابوونی هەتاو)) دەستەواژەی ((ئاوابوونی هەتاویان)) هێناوەتەوە و لەجیاتی ((نوێژێکیتر)) وتوویانە ((دوای ئێوارە)). باوکی هورەیرەحەدیسێکی لەپێغەمبەر(د.خ) هێناوەتەوە کەفەرموویەتی: ((کاتێك هەڵبژێردرام کەدووری تا رۆژی کۆتایی وەك دووری ئەم دووانە بوو)) ئەوسا پێغەمبەر (د.خ) پەنجە گەورە و دووەم پەنجەی دەستی خۆی نیشاندا. وەك ئەم حەدیسە کەسانیتر لەپێغەمبەرەوە گێراویانەتەوە کەهەموویان راستن: ((جابر کوڕی سەمورە ئەنس، سهل کوڕی سەعید، بەریدە، مستوردکوڕی شەداد و دەستەیەك لەگەورە پیاوانی ئەنصار((یاریدەدەران)).

باوکی جعفری گبری دەڵێت: جولەکەکان گومانیان دەکرد ئەوەی لەتەورات لەسەرەتای ئافراندنی ئادەم تا سەردەمی کۆچ جێگیر بووە، چوارهەزار و سێسەد و چل و دو ساڵە (٤٣٤٢). مەسیحیەکانی یۆنان وتوویانە: لەئافراندنی ئادەم تا کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ) پێنج هەزار و نۆسەد و نەوەد و دوو ((٥٩٩٢) ساڵ و یەك مانگە. بێژەرێك گومانی بردووە جولەکەکان ژماردنی ساڵەکانیان کەم کردۆتەوە چوونکە ویستویانە پێغەمبەری عیسی هەڵبووەشێننەوە لەبەر ئەوەی باس کردن و کاتی هاتنی عیسا لەتەوراتدا ئاماژەی پێدراوە. هەربۆیە ئەمانە ١٦١٥ ساڵیان لەو ژمارەیە کەم کردەوە کەتایبەتە بەعیسای مەسیح. جوولەکەکان وتیان: هێشتا ئەو

سەردەمەی لەتەورات بۆ هاتنی عیسا پێشبینی کراوە نەهاتووە. ئەمان بەگومانی خۆیان هێشتا هیوادران عیسا وەك پێغەمبەر بێتەخوار. باوکی جعفر دەڵێت: گومان دەکەم ئەوەی چاوەڕێی دەکەن و بانگەشەی وەسف کردنەکەی دەکەن، هەمان ((دەجالە)).

ئاگرپەرستەکان وتوویانە: ئەندازەی زەمان لەکاتی دەسپێکردنی پاشایەتی کیومەرس تا کۆچی پێغەمبەری ئیسلام سێ هەزار و یەك سەد و سی و نۆ (٣١٣٩) ساڵە. ئەمانە لەگەڵ ئەمەدا شتێتر بیرناهێننەوە کە لەپێش کیومەرس بناسرێت و پێش ئەو روون بکاتەوە. ئاگرپەرستەکان گومانیان دەکرد ئەو ئادەمە. شوێنکەوتوانی هەواڵ لەمبارەوە دژایەتیان هەیە. دەستەیەك وتەی ئاگرپەرستەکان بە بەهێز دادەنێن و دەستەیەك دەڵێن کیومەرس هەمان ئادەم بووە و دوای ئەوە ناوی کیومەرسی پێبرا کەبەسەر حەوت هەرێمەکە فەرمانڕەوایی دەکرد. ئەو هەمان حام کوڕی یافس کوڕی نوحە. ئەو چاکەی لەگەڵ نوح دا کرد و نوح داوای لەخوا کرد تەمەنی درێژ بەخۆی و منداڵەکانی و فەرمانبردنی سەرانسەری جیهان و بەردەوام بوونی پاشایەتییەکەی پێببەخشێت. لەبەرئەمەبوو داواکەی نوح هاتەدی و کیومەرس و منداڵەکانی بەپاشایەتی گەشتن و بەردەوام فەرمانڕەوایی ئێرانیان دەکرد تا موسوڵمانان گەشتنە تیسفون و پاشایەتیان لێسەندن. کەسانیتر شتی جیاواز لەمەیان ئاماژە پێداوە. باوکیجعفر محمد کوڕي جرير طبري بەوشێوەیە باسی دەکات.

دەڵێم: باوکیجعفر محمد کوڕي جرير طبري دوای ئەمە چەندین بەڵگەی هێناوەتەوە کەلەخۆگری تازە دەرکەوتنی زەمان و کاتە و ئەوەی ئایا خوا پێش ئافراندنی کات شتێکیتری ئافراندوە یانە. هەروەها چەندین بەڵگەی هێناوەتەوە کەلەخۆگری لەناوچوونی جیهانە کە جگە لەخوا هیچ نامێنێتەوە. ئەو بۆ ئەم قسانە بەڵگەی هێناوەتەوە کە ئاماژەدان پێیان دەخایەنێت و وتنەکەی شیاو نییە بۆ کتێبە مێژووییەکان چوونکە ئەم پرسیارانە بۆ زانستی پاساکانی دین شیاوترن و زانا ئیسلامیەکان لەبەرهەمەکانی خۆیان باسیان لێوە کردووە. هەربۆیە ئێمە بەجێهێشتنیمان بەشیاوتربینی.

## وتار لەبارەی ئافراندن و ئەوەی یەکەم دیاردە چیبوو

لە حەدیسێکی راست لەپێغەمبەری خوا کە ((عوبادە کوڕی سامت)) ئاماژەی پێداوە، هاتووە کەدەفەرمێت: ((یەکەم شت خوای گەورە ئافراندی، پێنوس بوو. خوا فەرمووی: بنووسە. لەوکاتەدا پێنوس بۆ نوسینی هەمووی ئەوەی هەبوو و هەیە و دەبێت، کەوتە سووڕان.)) ئەم گێرانەوەیە عەبدوالله کوڕی عەباس ئاماژەی پێداوە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم شت خوا ئافراندی، رووناکی و تاریکی بوو. ئەو تاریکی کردە شەوی رەش و رۆشنایی کردە رۆژی رۆشن. گێڕانەوەی یەکەم راسترە. وتەی محمد کوڕی ئیسحاقیان بۆ کەس نەگەڕاندۆتەوە. ((باوكي جعفر طبري)) رەخنەی لەخۆی گرتەوە کە گێرانەوەیەکی لە ((سوفیان)) لە باوکی هاشم لە جاهد لە کوڕی عەباس هێناوەتەوە کەدەڵێت: خوای گەورە پێش ئەوەی شتێك بئافرێنێت لەسەر عەرشەکەی خۆی بوو. یەکەم شت خوا ئافراندی پێنوس بوو کەهەمووی ئەودی تا رۆژی کۆتایی دەبێت، پێی نوسی. ئەو وەڵامی داوەتەوە ئەگەر ئەم حەدیسە راست بێت، شوعبەیش لە باوکی هاشم گێراویەتییەوە بەڵام نەیوتووە خوا لەسەر عەرش بووە. تەنیا ئەوەی وتووە یەکەم ئافرێنراو پێنوس بووە.

## وتار لەبارەی ئەوەی دوای پێنوس ئافرێنرا

دوای ئەوەی خوا پێنوسی ئافراند و فەرمانی پێدا هەرچی تا رۆژی کۆتایی دەبێت بنیوسێت و پێنوس نووسی، هەورێکی ناسکی ئافراند کەبەعەرەبی ((غمام)) یاهەوری سپی پێدەڵێن. دەڵێن باوکی رەزین عەقیلی لەپێغەمبەری پرسی: خوای ئێمە پێش ئافراندنی جیهان لەکوێ بوو؟ فەرمووی: لەهەورێکی سپی. لەژێر یا سەری هەوا نەبوو. خوا عەرشی خۆی لەسەر ئاو ئافراند کەهەمان هەوری سپیە. ئەمە ئەوەیە خوا لەفەرموودەکانی خۆیدا ئاماژە پێداوە و فەرمویەتی: ((ئایا ئەم بتپەرستانە کە اوەر بە پێغەمبەرەکەی ئێمە ناکەن، چاوی ئەوەیان هەیە خوا لەناو هەورێکی سپی

بێتە لایان. ((بقره/٢/٢١٠).

دەڵێم: شیاوە لەسەر ئەم وتەیە تێفکرین چوونکە پێشتر ئاماژە بەوە درا یەکەم شت خوا ئافراندی پێنوس بوو. خوا پێی وت بنووسە. پێنوس دەستی بە سووڕان کرد. ئەوسا لەدەسپێکی ئەم بەشەدا وتی خوا پێش ئافراندنی پێنوس و سووڕانی بەدەوری ئەوەی دەبێت، هەورێکی ئافراند. ئاشکرایە پێنوس دەبێت کەرەستەیەکی هەبێت پێی بنووسن و شتێکی دەوێت لەسەری بنووسن و ئەمە ئەو شتەیە لێرەدا بە وشەی ((لەوحی پارێزارو)) یادی دەکرێتەوە کەلەپێگەی دووەم دوای پێنوسە. و خوا زاناترە. دەتوانێت ئەمە بێت کە باوکی جعفری طبري ئاماژە پێدانی لەبیرکردووە کە ناوەرۆکی وتارەکەی بەشێوەی پەیوەست بوون زانیوە.

## ئەوەی دوای هەوری سپی ئافرێنرا

زاناکان لەبارەی ئەوەی دوای هەوری سپی ئافرێنرا بیروراکانیان جیاوازە. زوحاك کوڕی موزاجیم لە عەبدوالله کوڕی عەباسی گێراوەتەوە کەیەکەم شت خوا ئافراندی عەرش بوو و لەسەری ئارامی گرت. ئەوانیتر دەڵێن: خوا ئاوی پێش عەرش ئافراند و ئەوسا عەرشی ئافراند و لەسەرەوەی ئاو دایینا. ئەمە، وتەی باوکی ساڵح لە کوڕی عەباس و وتەی کوڕی مەسعود و وهب کوڕی مونەبە یە. دەڵێن ئەوەی خوا دوای عەرش ئافراندی، ئەم شتانە بوو: کورسی، عەرش، هەوا، تاریکی و ئاو کە عەرشی لەسەر دانا. وتویەتی: هەر کەس وتویەتی ئاو پێش عەرش ئافرێنراوە وتەکەی لەراستییەوە نزیکترە چوونکە حەدیسێك هەیە لە باوکی زەرین لەپێغەمبەر(د.خ) کەباسی ئەمە دەکات. هەروەها وتوویانە: کاتێك عەرش ئافرێنرا، ئاو لەسەرەوەی هەوا بوو. ئەم حەدیسە سەعید کوڕی جوبەیر لە کوڕی عەباس گێراویەتیەوە. ئەوانیتر وتوویانە: خوا پێنوسی پێش هەر شتێك ئافراندووە و هەزار ساڵ دوای ئەوە شتەکانیتر.

## (( ڕۆژێك كەخوا ئافراندنی زەوی و ئاسمانەكانی دەسپێكرد ))

لەبارەی ڕۆژێك كەخوای گەورە، ئافراندنی زەوی و ئاسمانەكانی دەسپێكرد بیروراكان جیاوازن. عەبدوالله كوڕی سلام و كەعب و زوحاك و موجاهد وتوویانە: دەسپێكی ئافراندن ڕۆژی یەكشەمە بوو. محمد كوڕی ئیسحاق وتویەتی ڕۆژی ئافراندن شەممە بوو. باوكی هورەیرەیش بەم شێوەیە ئاماژەی پێداوە. هەروەها لەبارەی ئافرێنراوی هەر ڕۆژ بیروراكانیان جیاوازە. عەبدوالله كوڕی سلام وتوویەتی: خوای گەورە ئافراندنی لەڕۆژی یەك شەممە دەسپێكرد. كەواتە زەوییەكانی لەڕۆژی یەك شەممە و دوو شەمە ، ڕۆژی و كێوەكانی لە ڕۆژی سێ شەممە و چوارشەممە و ئاسمانەكانی لە ڕۆژی پێنج شەممە و هەینی ئافراند.

ئەو لەدوایین ساتەكان لەڕۆژی هەینی حەوایەوە و لەوكاتەدا ئادەمی ئافراند و ئەمە ئەو كاتەیە ڕۆژی كۆتایی دەسپێدەكات. گێڕانەوەی هاوشێوەی ئەم حەدیسە عەبدوالله كوڕی مەسعود و عەبدوالله كوڕی عەباس لەگێڕانەوەی باوكی سالَح لەم دوانە، باسیان كردووە بەلاَم ئەم دووانە ئافراندنی مرۆڤ و ڕۆژی كۆتاییان باس نەكردووە.

عەبدوالله كوڕی عەباس لەگێڕانەوەی علی كوڕی باوكی تەلَحە لەو دەلَێت: خوا زەوی پێش ئەوە دروست كرد كە بلاَوی بكاتەوە. ئەوكات ڕوی كردە ئاسمان و كردییە حەوت ئاسمان و دواتر زەوی بلاَو كردەوە و ئەمە هەمان فەرموودەی خوای گەورەیە كەفەرموی: (( دوای ئەوە زەوی بلاَو كردەوە)) (نازعات/٧٩/٣٠). منیش ئەم قسەیە بەڕاست دەزانم. عەبدوالله كوڕی عەباس لەگێڕانەوەی (عێكرمە) لەو وتویەتی: خوا دو هەزار سالَ پێش ئەوەی جیهان دروست كات ((كەعبەی)) لەسەر چوارستوون لەسەر ئاو جێگیر كرد و ئەوسا زەوی لەژێر كەعبە بلاَو بوویەوە. كوڕی عومەریش هاوشێوەی ئەمەی ئاماژە پێداوە. دەستەیەك لە باوكی سالَح و لە باوكی مالك و لە عەبدوالله كوڕی عەباس و لە موڕەی هەمەدانی و لەعەبدوالله كوڕی مەسعود لەبارەی ئەم فەرموودەی خوای گەورە شتێكیتریان ئاماژە پێداوە ((ئەو، هەمان پەروەردگارە كەهەموو شتەكانی زەوی بۆ ئێوە ئافراند و دواتر ڕویكردە ئاسمان و كردیی بەحەوت ئاسمان)) (بقرە/٢/٢٩). دەلَێن: عەرشی خوای گەورە لەسەر ئاو بوو و ئەو هێشتا هیچ كام لەشتەكانی پێش ئاو نەئافراندبوو. كاتێك ویستی ئافرێنراوەكان بئافرێنێت، لەئاو

دووکەڵێك هاتەدەر کەکەوتە سەرئاو و لەسەر ئاو جێگەی گرت و لەم رووەوە بە «سماء» ((بەرزایی—ئاسمان)) ناوی برد. دواتر ئاوی وشك کرد و کردی بە زەوییەکی تاك. دواتر لێکی کردەوە و حەوت زەوی دروست کرد و ئەمە لەرۆژی یەك شەممە و دوشەممەدا بوو. دواتر زەوی لەسەر پشتی ماسی جێگیر کرد و ماسی هەمان ((نون))ە کەخوای گەورە لە قورئان ئاماژەی پێدەدات و فەرمویەتی: ((ن و القلم و ما یسطرون)) (قلم/١/٦٨). ماسی لەئاو و ئاو لەسەر بەردێکی گەورەی پان و تەخت بوو، تاشە بەرد لەسەر پشتی فریشتەیەك و فریشتە لەسەر پشتی تاشەبەردێکیتر و تاشەبەرد لەسەر هەوا. ئەمە هەمان تاشە بەردە لوقمان ئاماژەی پێداوە کە نەلەزەمینە و نە لەئاسمان. ماسی تەکانێکی خوارد و جوولا و بوومەلەرزە زەوی داگرتەوە. خوا کێوەکانی لەسەر جێگیر کرد و زەوی ئارامی گرتەوە. هەربۆیە بەردەوام کێوەکان شانازی بەسەر زەویدا دەکەن و ئەمە هەمان فەرموودەی خوای گەورەیە، فەرمویەتی: ((خوا لەسەر زەوی کێوە بەهێز و نەجولاوەکانی بەهێزکرد تا زەوی نێوە نەلەرزێتەوە (لقمان/١٠/٣١). کوڕی عەباس و زوحاك و موجاهد و کەعب ونەوانیتر دەڵێن: هەر رۆژێك لەم شەش رۆژە کە خوا زەوی و ئاسمانی تیا ئافراند، وەك هەزار ساڵە.

## وتار لەبارەی ئەوەی ((رۆژ)) لەم باسەدا مەجازییە

دەڵێم: ئەوەی لەم گێرانەوانەدا هاتووە خوا زەوی لەم رۆژ یا ئەو رۆژەدا ئافراندووە، مەجازییە چوونکە لەو رۆژەدا شەو و رۆژێك لەکاردا نەبووە. شەو و رۆژ لە هەڵاتن و ئاوا بوونی خۆر دەردەکەون و لەوساتەدا ئاسمان و هەتاو لەئارادا نەبووە. خواستی ئەوان ئەندازەیەك بەرامبەر یەك رۆژە وەك چۆن فەرمویەتی ((رۆژی ئەوان لەکاتی بەرەبەیان و شەوانە پێیان دەگات))(مریم/٦٢/١٩) ئەم ئایە لەبارەی بەهەشتییەکانە و دەزانین لەبەهەشت بەرەبەیان و شەو لەئارادا نییە.

## وتار لەبارەی شەو و ڕۆژ و ئەوەی کامیان پێش ئەویتر ئافرێنراوە

بێشتر ئاماژەی پێدرا خوای گەورە چ شتێکی پێش ئافراندنی کات و زەمانەکان ئافراندووە. وتمان کات و ساتەکان هەمان کاتژمێرەکانی شەو وڕۆژن و ئەمە بریتیە لە پێوانی مانگ و هەتاو، پلەکانی ئاسمان. ئێستا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین دەسپێکی ئافراندن کامیان بوون، شەو یا ڕۆژ؟ زاناکان لەمبارەوە بیروڕاکانیان جیاوازە. دەستەیەکیان دەڵێن: شەو پێش ڕۆژ ئافرێنراوە. ئەوان بەم شێوە بەڵگەیان هێناوەتەوە کەڕۆژ، دواهاتی ڕووناکی هەتاوە و کاتێك هەتاو ئاوا دەبێت تاریکی دەردەکەوێت. لێرەوە ڕوون دەبێتەوە ڕۆژ – یانی هەمان ڕوناکیی—پێش تاریکی کەوتووە کەشەوە. ئەگەر ڕووناکی هەتاو نەبێت، شەو بەردەوام دەبێت. لێرەوە دەردەکەوێت شەو لە پێش ڕۆژەوەیە. ئەمە وتەی عەبدوالله کوڕی عەباسە.

دەستەیەکی دیکە دەڵێ،: ڕۆژ پێش شەو بووە. بەڵگەی ئەوان ئەمەیە، خوای گەورە بوو و هیچی لەگەڵدا نەبوو، نەڕۆژ و نە شەو. ڕوناکی خوا هەموو شتێکی ڕون کردۆتەوە تا ئەوەی شەو ئافرێنرا. عەبدوالله کوڕی مەسعود دەڵێت: ((لای خوای ئێوە شەو و ڕۆژێك نییە و ڕوناکیی زەوی و ئاسمان ڕەنگدانەوەی تیشکی ڕوخساری خوایە.)) ئەبوو جعفرطبري دەڵێت: یەکەم: وتاری یەکەم لەڕاستییەوە نزیکترە. دووەم ئەوەی خوا فەرمویەتی: ((ئایا ئێوە بەهێزتر و دژوارترن لە ئافراندن یاناسمان؟ کەخوا جێگیری کرد و بێ کۆڵەکە ڕایگرت، شەوی تاریك کرد و ڕۆژەکەی ڕوناك کردەوە. (نازعات/٧٩/٢٧-٢٩) لێرەدا دەردەکەوێت خوای گەورە سەرەتا ئاماژەی بە شەو داو .

# ئافراندنی مانگ و هەتاو

دەڵێم: ئەبوو جعفرطبري چیرۆکێکی درێژی هێناوەتەوە کە لەخۆگری چەندین بەرگ کتێبە، لەعەبدوالله کوری عەباس لەپێغەمبەر (د.خ) لەبارەی ئافراندنی مانگ و هەتاو و سووڕانی ئەوان. هەتاو و مانگ لەسەر دوو گەردونەن کە لەهەر گەردونەیەکدا ٣٦٠ رشتە بەستراوە. ئەم دووانە لەگەردونەکان دەکەونە ناو زەریایەك لەنێوان زەوی و ئاسمان و بەم شێوەیە خۆر گرتن و مانگ گرتن دەرکەوت. ئەوسا فریشتەکان ئەم دووانە دەردەهێنن و ئەمە هەمان تیشکدانەوەی ئەم دووانە دوای گیرانە. ئەبوو جعفرطبري ئاماژەی بە ئەستێرەکان و سووڕانی ئەوان داوە و هەڵاتنی خۆری لە شوێنی ئاوا بوونی ئاماژە پێداوە. ئەوسا شارێکی لەسەرزەوینی رۆژهەڵات بەناوی ((جابەرسا)) و شارێکی لەسەرزەوینی رۆژئاوا بەناوی((جابەرقا)) ناو بردوە کە هەرکام دوانزە هەزار دەرگای هەیە و لەسەر هەر دەرگایەك دوانزە هەزار دەرگاوان کە هەر کام یەك جار پاسەوانی دەدەن و تا رۆژی کۆتایی، سەرەی هیچ کامیان ناگاتەوە (( کە ژماری خەڵکەکانی بێ سنوور بێکۆتاییە)). ئەو لە یاجوج و ماجوج و منسك و ساریس و شتی تر ناوی بردوە کە پێویست بە ئاماژەدان ناکات. من باوەرم بەم قسانە نییە چوونکە لەگەڵ ئاوزدا یەك ناگرنەوە. ئەگەر بەڵگەکانی راست دەبوون ئاماژەم پێدەدان و باوەرم پێدەکردن بەڵام ئەم حەدیسە ناراستە. ئەم کارە گەورانە شیاو نییە بەم جۆرە بەڵگە لاوازانە لە کتێبەکاندا ناوبێنن.

ئێمە سنووری دەسپێکردنی ئافراندنمان ئاماژە پێدا کەخوای گەورە ئەوەی دەیویست بناغەی بۆ دارشت و دروستی کرد تا ئەو کاتەی لەئافراندن بێ نیاز و ساڵەکانی جیهانمان ژمار کرد و درێژی رۆژگارمان باس کرد، خواستی سەرەکی ئێمە لەم کتێبەدا بیرکردنەوەی ئەو شتەبوو کەوتمان ئاماژەی پێدەدەین یانی مێژووی پاشا زاڵمەکان و گوناحکار و نافەرمانەکان لەبەرامبەر خوا و پاشا دادپەروەرەکان و فەرمانبردارەکان و و رۆژگاری پێغەمبەرەکان و نێردراوان. ئێمە لێرەدا ئاماژەمان بەو شتانەدا مێژوو لەگەڵیاندا یەك دەگرێتەوە و رۆژگارەکان بەوان دەناسرێنەوە کە هەمان مانگ و هەتاون.

ئێستا دەبێت لەیەکەم کەسەوە دەسپێبکەین کەخوا پاشایەتی پێ بەخشی و ئەو ناسپاسی کرد و حاشای لەخوایەتی خوا کرد و خوا بەخشینەکانی خۆی لێ سەنجەوە و لاواز و ریسوا کرد.

دوای ئەوە ئاماژە بەو کەسانە دەدەین دوابەدوای ئەو هاتن و رێگەی ئەویان گرتەبەر و لەبەر ئەمە، خوا سزای خۆی بەسەردا باراندن. هەروەها ناوی ئەو کەسان دەبەین بەرامبەری ئەوان هەژمار دەکرێن و پاشاکانی فەرمانبرداری خوا دەژمێردرێن و لەخۆیان یادگاری ئەمریان بەجێهێشتووە. هەروەها باسی پێغەمبەران و نێردراوان دەکەین و ئەمانە هەموویان پەیوەستن بە ویست و خواستی خوا.

## داستانی ئیبلیس و ناچار کردنی ئادەم بەگوناحکاری

یەکەم کەس لەنافەرمانان کەرێبەر و سەروەری ئەوانە، ئیبلیس بوو. خوای گەورە پلە و پایەیەکی باشی پێبەخشی و رێزی لێگرتبوو. ئەوی کردبووە پاشای شاکانی جیهان و ئەمە بەپشت بەستن بەوتاری مێژوونوسانە. خوا ئەوی کردبووە یەکێك لەپاسەوانانەی گەنجینەکانی بەهەشت. ئەو نافەرمانی کرد و بانگەشەی خوایەتی بەرز کردەوە و ژێردەستەکانی خۆی بۆ پەرستنی خۆی هاندا. بۆیە خوای گەورە ئالوگۆری بەسەردا هێنا وکردی بەدێوێکی دوورخراوە و روخساری قێزەون کرد و ئەوەی پێی بەخشیبوو، لێی سەندەوە. بەنەحلەتی کرد و لەم جیهانە لەئاسمانەکان دەریکرد و شوێنی ئەوی لەودنیا کردە جەهەننەم. پەنا دەبەین بەخوای گەورە لەئاگری جەهەننەم و پەنا دەبەین بەخوای گەورە لەتووڕەیی ئەو و لەکەمبوونەوەی دوای زیادبوون.

ئەم داستانە بەئاماژەدان بە گێرانەوەی رابردووان دەسپێدەکەین کەخوا بە ئیبلیس چی بەخشی و چەندە گەورەیی پێبەخشیبوو. ئەو، بانگەشەی ئەوشتانەی دەکرد کە ئەیبوو و دواتر داستانی پاشایەتی و فەرمانرەوایی ئەو تاکاتی بەسەرچوونی باس دەکەین و هۆکاری ئەم رووداوە بەخواستی خوا ئاماژە پێدەدەین.

## بەسەرهاتەکان لەبارەی پاشایەتی ئیبلیس

## (( ئەحلەتی خوای لێبێت )) و رووداوەکانی رۆژگاری پاشایەتی ئەو

دەگێرنەوە لەعەبدوالله کوڕی عەباس و عەبدوالله کوڕی مەسعود کەئیبلیس پاشای ئاسمانی جیهان بوو . ئەولەدەستەیەك لەفریشتەکان بوو کەپێیان دەوترا ((پەری)) و ئەمانە بۆیە بەپەری ناودەبران چوونکە پاسەوانی گەنجەکانی بەهەشت بوون. ئیبلیس لەهەمان کات کەپاششا بوو، پاسەوانی گەنجەکانی بەهەشتیش بوو. کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو نافەرمانی خوای گەورەی کرد و خوا ئەوی هەڵگەڕاندەوە و کردی بەدێوێکی دوورخراوە. لە قتادە دەگێرنەوە: ئەم ئایە بەتایبەت سەبارەت بەئیبلیسە، دوای ئەو قسە نەشیاوانە کردی و خوا ((کردی بەدێوێکی دوورخراوە)) فەرمووی: ((هەرکەس لەوان بڵێت من جیاواز لەخوا، خوام، سزاکەی دەکەینە دۆزەخ و ستەمکاران بەم شێوەیە سزا دەدەین))(انبیا/٢١/٢٩). لە کوڕی جورەیج هاوشێوەی ئەمە دەگێرنەوە.

یەکێك لەو رووداوانەی لەسەردەمی پاشایەتی و فەرمانڕەوایی ئیبلیس روویدا ئەمەیە لەزوحاك لەعەبدالله کوڕی عەباس گێردراوەتەوە، دەڵێت: ئیبلیس لەدەستەی ئەو فریشتانە بوو پێیان دەوترا پەری و ئەمانە لەئاگری بێ دووکەڵ دروست کرابوون. ئیبلیس پاسەوانێك لەپاسەوانەکانی بەهەشت بوو. دەڵێت: فریشتەکان لەروناکی دروست کراون و ئەو پەریانەی لەقورئان ئاماژەیان پێدراوە لەتێکەڵەیەك لەئاگر ئافرێنراون (رحمان/٥٥/١٥) و ئەمە هەمان بڵێسەی ئاگرە کە لەکاتی داییسان بڵێسە دەسەنێت. مرۆڤ لەگڵ دروست کرا. یەکەم کەسان جێگەیان بوو بەبەهەشت، پەرییەکان بوون کە تیایدا کوشتاریان کرد و خوێنیان رشت و یەکتریان دەکوشت. دەڵێت: لەمکاتەدا، خوا ئیبلیسی لەگەڵ دەستەیەك لە فریشتەکان ناردە سەریان و ئەوان ئەم دەستە بوون کەپێیان دەوترا پەرییەکان. ئیبلیس و هاوەڵانی شەڕیان لەگەڵدا کردن و ئەوانیان بۆ دوورگەی دەریاکان وکوێستانەکان دوورخستەوە.

کاتێك ئیبلیس ئەم کارەی کرد، لەناخی خۆیدا لەخۆبایی بوو و وتی: کارێکم کرد کەس توانای ئەنجامدانی نییە. خوای گەورە لەنهێنی دڵی ئاگادار بوویەوە. کەس لەو فریشتانەی لەگەڵیدا بوون لەمە ئاگادار نەبوون.

لە ئەنسیش ئەم داستانە دەگێرنەوە. هەروەها باوکی ساڵح لەعەبدوالله کوڕی عەباس و مورەی هەمەدانی لەعەبدوالله کوڕی مەسعود گێراویانەتەوە: کاتێك خوا لەئافراندنی ئەوەی دەیویست تەواو بوو، رۆشتە سەر عەرش و ئیبلیسی کردە پاشای ئاسمانی جیهان و ئەو لەدەستەیەك لە فریشتەکان بوو کەپێیان دەوترا پەری. بۆیە پێیان دەوترا پەری چوونکە لەپاسەوانانی بەهەشت بوون. ئیبلیس لەهەمان کات کەپاشا بوو لەپاسەوانانی بەهەشتیش هەژمار دەکرا و لەبەر ئەمە لەدڵی خۆیدا لەخۆبایی بوو، وتی: ئەم پێگەیە خوابەمنی نەداوە مەگەر ئەوەی تایبەتمەندی لەپێشترم لە فریشتەکانیتر هەبێت. خوا لەم نهێنییە ئاگادار بوویەوە و فەرمووی: لە زەوی جێنشینێك بۆ خۆم دادەنێم (بقرە/۲/۳۰).

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: ناوی ئەو ((عەزازیل)) و کۆشاترین و زاناترینی فریشتەکان بوو و ئەم کارە بووە هۆی نافەرمانی کردنی ئەو.

ئەمە، وتاری سێیەم لەنافەرمانی کردنی ئەوە. عێکرەمە لە عبدوالله کوڕی عەباس دەگێڕێتەوە کەخوای گەورە ئافرێنراوەکانی ئافراند و پێیانی فەرموو: کورنوش بۆ ئادەم ببەن. وتیان: نایبەین. خوا ئاگرێکی بۆ هەلأیساندن و ئەوانی سوتاند. ئەوسا ئافرێنراوی تری ئافراند و فەرمووی: خەڵکانێك لەگڵ دروست دەکەم (ص /۳۸/۷۱)، کەواتە کورنوش بۆ ئادەم ببەن. ئەوان نافەرمانیان کرد. خوای گەورە ئاگرێکی پێ کرد و ئەوانی سوتاند. ئەوسا ئەم فریشتانەی ئافراند و فەرمووی: کورنوش بۆ ئادەم ببەن. وتیان، دەیبەین. ئیبلیس لەو کەسانەبوو کورنوشی بۆ ئادەم نەبرد. شەهر کوڕی حەوشب دەڵێت: ئیبلیس لەو پەرییانە بوو لە مانەوە و فریشتەکان ئەوانیان لەئاسمان دەرکردبوو. یەکێك لەفریشتەکان، ئیبلیسی بەدیلی گرت و بردیەوە بۆ ئاسمان. گێرانەوەیەکی هاوشێوە لەسەعید کوڕی مەسعود دەگێرنەوە.

نزیکترین قسە لەراستی ئەوەیە داستانەکە لەفەرموودەی خوای گەورەوە بگێرینەوە کە دەفەرمێت: بیربێنەرەوە ئەو کاتەی فەرمانمان بە فریشتەکاندا کورنوش بۆ ئادەم

ببەن. هەموویان کورنوشیان برد مەگەر ئیبلیس کەلەپەرییەکان بوو و نافەرمانی خوای کرد (کهف/١٨/٥٠). شیاوە بووترێت نافەرمانی لە لەخۆباییبوونی ئەوسەرچاوەی گرت چوونکە خوای دەپەرستی و هەوڵی زۆری بۆ پەرەستنی خواوەند ئەنجام دەدا. هەروەها شیاوە بزوێنەری ئەم کارە پەری بوونی ئەو هەژمار بکەین.

## ئافراندنی ئادەم

لەداستانەکانی فەرمانرەوایی ئەو ئافراندنی باوکی ئێمە ئادەمە. ئەمە بەوشێوەیە:
کاتێك خوای گەورە مەبەستی ئەوەی کرد فریشتەکانی خۆی لەتەشەنە سەندنی لەخۆبایبوون لە ئیبلیسدا ئاگادار بکاتەوە و فریشتەکان ئەمەیان نەدەزانی تا ئەوەی کاری ئەو بەلەناوچوون کۆتایی پێهات و پاشایەتییەکەی لەروخان نزیك بوویەوە، بەفریشتەکانی فەرموو: من لەزەوی جێنیشنێك بۆخۆم دروست دەکەم. وتیان : ئایا لەزەویدا کەسێك دەکەیتە جێگر کەخراپە و خوێنرشتن دەکات؟ (بقرە/٢/٣٠)
لە کوڕی عەباس دەگێرنەوە فریشتەکان بۆیە ئەو قسەیان وت کەبیرەوەریان لەکاری ئیبلیس و فریشتەکانی پێشتر لەسەر زەوی هەبوو. بۆیە بەخوای گەورمیان وت: ئایا لە زەوی ئەو کەسانە دادەنێت وەك پەرییەکان بن و خوێن برێژن و خراپە بکەن و گوناحی تۆ ئەنجام بدەن، لەگەڵ ئەوەی ئێمە وەسفی تۆدەکەین و تۆ دەپەرستین.
خوا پێی فەرموون: ئەو شتانە دەزانم ئێوە نایزانن ((بقرە//٣٠) مەبەستەکەی بەهێزبوونی لەخۆباییبوونی ئیبلیس و نافەرمانی ئەو و لەخۆرازیبوونی بوو کەئێستا دەیویست بۆ فریشتکانی رون بکاتەوە تابەجوانی ببینن و تێیبگەن.
کاتێك خوا ویستی ئادەم بنافرێنێت، فەرمانی بەجبرەئیل دا لەسەر زەوی گڵی بۆ بێنێت. زەوی وتی: لەتۆ پەنا بۆخوادەبەم ئەگەر لێم کەم کەیتەوە و گلاوم بکەیت. جبرەئیل گەرایەوە و هیچی لەسەرزەوی هەڵنەگرت و بەخوای وت: زەوی پەنای بۆتۆ هێنا و منیش پەنامدا. خوا میکائیلی نارد و زەوی لەو پەنای بۆ خوا هێنا و میکائیل بەدەستی خاڵی گەرایەوە و هاوشێوەی قسەی جبرەئیلی بەخوا وت. لەوکاتەدا خوا فریشتەی مەرگی نارد و زەوی لەو پەنای بۆخوا برد بەلام فریشتەی مەرگ فەرمووی: پەنا بۆخوادەبەم بێ ئەنجام نەدانی فەرمانی خوا بۆ لای خوا بگەرێمەوە. لەسەر زەوی گڵی هەڵگرت و تێکەڵی کرد. لەیەك شوێن هەڵی نەگرت بەڵکو گڵی سوور و سپی و رەش و زەردی هەڵگرت و گڵێکی لکێنەری کۆکردەوە و بۆیە دەبینین منالەکانی ئادەم جۆراوجۆرن.
باوکی موسی لەپێغەمبەر (د.خ) حەدیسێك دەهێنێتەوە کەدەفەرمێت: خوا ئادەمی

لەمشتێك گڵ دروست کرد، گڵی لەسەر زەوی هەڵگرت و لەبەر ئەمە مرۆڤەکان بەئەندازەی ئەو گڵەی لەزەوی هەڵگیرا، سوور و سپی و رەش و سەختگیر و ئاسانگر و پاك و پیسن. ئەوسا گڵ لەگەڵ ئاو تێکەڵ کرا تا بووبە قوورێکی لکێنەر و دوای ئەوە وازی لێهێنرا تا بوو بەلیتاوێکی گەنیو. دووبارە وازی لێهێنرا تا بووبەخشتی کاڵ بەهەمان شێوە کەخوای گەورە فەرمویەتی: ((خەڵکم لەخشتی کاڵ، لە (تەلخەبی)رژاوە لەسەر زەوی ئافراند.

بۆیە بەئادەم بانگیان کرد چوونکە لە ((ئەدیەم))زەوی یانی لەسەر زەوی دروستکرا. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت. خوا فەرمانیدا گڵی ئادەم هەڵبگیرێت. ئادەم لەگڵێکی لکاو لە لیتاوێکی گەنیو ئافرێنرا. گڵی ئەو دوای لکێنەری بۆ جۆرێك گڵی گەنیو گۆرا و ئەوسا خوا ئادەمی بەدەستی خۆی دروست کرد تا ئیبلیس لەکورنوش بردن بۆ ئەو نافەرمانی نەکات: ئادەم چل شەو – یا چل ساڵ – وەك پەیکەرێکی کەوتوو لەسەر زەویّ بەجێهێڵدرا و ئیبلیس دەهات و بەقاچ لێیدەدا بەشێوەیەك ئاوازی دەدایەوە و ئەمە هەمان فەرموودەی خوای گەورەیە کەدەفەرمێت: ((خەڵکم لەخشتێکی کاڵ وەك خشتێکی سوورەکراو ئافراند))(الرحمان/٥٥/١٤)دەفەرمێت: لەپەیکەرێکی دەچوو، ناوپڕنەبوو یانی ناو خاڵی بوو.

ئەوسا ئیبلیس دەهات و لەدەمیەوە دەرۆشتە ناو و لە قنییەوە دەهاتەدەر و دوبارە لە قنییەوە دەرۆشتە ناو و لەدەمیەوە دەهاتەدەر، وتی: شتێك نیت و بۆ خواستێك لەخواستەکان دروستکراویت ((یا بۆ خواستێکی گەورە ئافرێنراویت)). ئەگەر بەسەرتۆدا زاڵ ببم تۆ لەناو دەبەم و ئەگەر تۆ پێش من بخەن نافەرمانی دەکەم. فریشتەکان لای ئادەمەوە تێدەپەڕین و لێی دەترسان و ئیبلیس زیاتر لەهەموویان دەترسا.

کاتێك کاتی ئەوەهات خوا گیانی بکاتەبەر، بەفریشتەکانی فەرموو: ((کاتێك بەژن و باڵای ئەو راست دەکەمەوە و گیان دەکەمەبەری، چۆك دابدەن و کورنوشی بۆ ببەن))(حجر/٢٥/٢٩: ص/٣٨/٧٢).

کاتێك گیانی کردەبەر، گیان لەلای سەریەوە گەشتە جەستەی – گیان بەهیچ شوێنێك لەجەستەی نەگەشت مەگەر ئەوەی بوو بەگۆشت–. کاتێك گیان گەشتە

سەری، پژمی و فریشتەکان پێیان وت سپاس بۆخوا. دەڵێن: خوا سپاس کردنی خستە دڵی ئەو و ئەو وتی: سپاسی من بۆ خوایەك کە خاوەنی جیهانیانە.

کاتێك گیان گەشتە چاوی، سەیری میوەکانی بەهەشتی کرد و کاتێك گەشتە ناویان ئارەزوی خواردنی کرد و پێش ئەوەی گیان بگاتە قاچەکانی، لەشوێنەکەی هەستا و بەرەو میوەکان رایکرد و لەبەر ئەمدیە خوای گەورە فەرمویەتی: ((خەڵك لەخێراییدا دروست کراوە))(انبیا/٢١/٣٧). فریشتەکان هەموویان کورنوشیان بۆ برد جگە ئیبلیس کەنافەرمانی کرد و رۆشتە ریزی نافەرمانان و ناسپاسان.

خوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس، کاتێك فەرمانم پێکردی کورنوشی بۆ ببەیت، چ شتێك بووە لەمپەر لەوەی کورنوشی بۆ نەبەیت؟ وتی: لەو باشترم. لەوانە نەبم کورنوش بۆ کەسێك بەرم لە گڵ دروستت کردووە. ئەو لەبەر لەخۆبایبوون و ستەمکاری و رژدی بردن کورنوشی نەبرد. خوا پێی فەرموو: ئەی ئیبلیس چ شتێك بووە لەمپەر لەسەر رێگەی کورنوش بردن بۆ کەسێك کە بەدودەستی خۆم دروستم کردووە؟ نافەرمانیت کرد یا پێشکەوتیت و خۆت بەلەپێشتر لەهەمووان دەزانیت؟ وتی: لەو باشترم، منت لەئاگر ئافراند و ئەو لەگڵ. خوا فەرمووی: لە ئاسمان دوورکەوەرەوە کەتۆ لە ئاسمان دەرکراویت و نەحلەتی من لەتۆ بێت تا رۆژی کۆتایی. ئیبلیس وتی: خوای من، کەواتە دەرفەتم پێبدە تا ئەورۆژەی ئەمانە هەڵدەستن. خوا فەرمووی: تۆ لەمۆڵەت پێدراوانی تا ئەو رۆژەی کاتەکەی زانراوە. ئیبلیس وتی: سوێند بەخوایی تۆ ئەمانە بێ گومان گومرا و لەرێبەدەر دەکەم جگە لەو دەستە لەبەندەکانی تۆ کەتەنیا تۆ دەپەرستن و تەنیا تۆ دەناسن و دڵێکی پاکیان هەیە. خوا فەرمووی: راست دەڵێم و راست دەفەرمووم کەبێ گومان جەهەننەم لەتۆ و لەشوێنکەوتوانی تۆ پڕدەکەم(ص/٣٨/٧٥—٨٥)

کاتێك خوا لەکاری ئیبلیس وسەرکۆنە کردنی ئەو تەواو بوو و ئیبلیس جگە لەنافەرمانی رێگەیەکی دیکەی نەگرتەبەر، نەفرەتی لێکرد و ئەوی لەخۆشەویستی خۆی بێبەش و بێهیوایی کرد و کردی بەدێوێکی دوورخراوە و لەبەهەشتەکەی خۆی دووری خستەوە.

شەعبی دەڵێت: ئیبلیس دابەزی و لەم کاتەدا پۆشاکی خۆی لەلای راست لەسەر دەست

و شانی چەپی خستبوو و لەسەر سەری دەستارێك بوو، ئیبلیس یەكچاو تەنیا یەك قاچی پێڵاوی تیا بوو.

حەمید كوڕی هیلال دەڵێت: ئیبلیس بارسوك لەئاسمان هاتەخوار و هەربۆیە سوك كردن و كورتكردنەوەی نوێژ ناپەسەندە.

كاتێك ئیبلیس دابەزی، وتی: خوایە، منت بۆ ئادەم لەبەهەشت دەركرد ومن بێجگە لەهاوكاری تۆ ناتوانم بەسەریدا زاڵ ببم. خوا فەرمووی: تۆ بەسەر ئەودا زاڵیت (( تۆم بەسەر ئەودا زاڵ كرد). ئیبلیس وتی: زۆریكە. خوا وتی: ئەو هیچ منداڵێكی نابیت مەگەر ئەوەی بۆ تۆیش منداڵێكی بێت وەك ئەو. ئیبلیس وتی: زۆریكە. خوا وتی: دڵی ئەوان شوێنی تۆ دەبێت و تۆ وەك خوێن لەناو رۆحی ئەواندایت. ئیبلیس وتی: زۆریكە. خوا وتی: سوار و پیادەی خۆت بەسەر ئەواندا غاردە و لە دارایی و منداڵەكانیان هاوبەش بە و مژدەی درۆینەیان پێبدە ((ناوەرۆكەكەی لە سوورەی انبیا/١٧/٦٤)).

ئادەم وتی: خوایە، تۆ مۆڵەتت بەدێودا و بەسەرمندا زاڵت كرد و من لەزیانی ئەو جگە لەتۆ ناتوانم پەنا بۆ كەس ببەم. خوا فەرمووی: ئێوە هیچ منداڵێكتان نابیت مەگەر ئەوەی كەسێك دیاری بكەم تا لەهاودەمی كەسانی خراپ دووریان بخاتەوە. ئادەم وتی: زۆریكە. خوا فەرمووی: كاری چاكەی ئێوە دەبەرابەر پاداشت دەدەم و زیادی دەكەم و كاری خراپە تەنیا سزایەكی تاقانەی بۆ دیاری دەكەم یا پاكی دەكەمەوە و لێی خۆشدەبم. ئادەم وتی: خواوەندا، زۆریكە. فەرمووی: ئەی بەندەكانی من كەستەمتان لەخۆتان كرد، لەخۆشەویستی خوا بێ هیوا مەبن چوونكە خوا لەهەموو مرۆڤەكان خۆش دەبێت (زمر/٣٩/٥٣). ئادەم وتی: خواوەندا، زۆریكە. فەرمووی: گەڕانەوە لەگوناحكاران، (تۆبە) لەمنداڵەكانی تۆ تا دوایین هەناسە ناگرمەوە. ئادەم وتی: خواوەندا زۆریكە. فەرمووی: بەردەوام دەبەخشم و لەكەسیش ناترسم. ئادەم وتی: بەسمە.

ئەوسا خوا رویكردە ئادەم و فەرمووی: برۆ لای ئەو دەستە لەفریشتەكان و بڵێ سڵاو لەئێوە بێت. ئادەم رۆشتە لایان و سڵاوی لێكردن. ئەوانیش وتیان: بۆ تۆبێت سڵاوی خوا و خۆشەویستی خوا. دواتر ئادەم گەڕایەوە بۆ لای خوا. خوا فەرمووی: ئەم

سڵاوە بۆتۆیە و سڵاوی منالەکانی تۆ لەناویدایە. کاتێك ئیبلیس لەکورنوش بردن خۆی بەدوورگرت و ئەوەی دایپۆشیبوو بۆ فریشتەکان دەرکەوت. خوا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد.

## (( ئەو ناوانەی خوا فێری ئادەمی کرد ))

زاناکان لەبارەی ناوەکان بەجیاوازی قسەیان کردووە. زوحاک لەعەبدواللە کوڕی عەباس دەگێڕێتەوە: ئەو ناوانەی فێرکرد خەڵکان لەناو خۆیاندا، یەکتر و شتەکانی دەوروبەری خۆیان بناسن و بیناسێنن. مرۆڤ، ئاژەڵ، زەوی، دەشت، کێو، ئەسپ، کەر و هاوشێوەی ئەوان و تەنانەت تس و تڕ. موجاهد و سەعید کوڕی جوبەیر هاوشێوەی ئەمەیان باس کردووە. کوڕی زەید دەڵێت: خوا ناوی منالەکانی فێری ئادەم کرد. رەبیع دەڵێت: خوا ناوی فریشتەکانی فێری ئادەم کرد.

کاتێك ئادەم ناوەکان فێربوو، خوا خاوەن ناوەکانی بردە لای فریشتەکان و فەرمووی: لەناوی ئەمانە ئاگادارم بکەنەوە ئەگەر راست دەکەن (بقرە/ ٢/٣١). ئەگەر جێگری خۆم لەناو ئێوەدا هەڵدەبژارد، هەمووان فەرمانی منتان دەبرد و بەپاك و بەرێزتان دادەنام و نافەرمانی منتان نەدەکرد. ئەگەر جێگری خۆم لەکەسانی جیاواز لەئێوە هەڵبژێرم، لەزەوی خراپە و خوێن رشتن دەکاتە پیشە. ئەگەر ئێوە - کە ئەمشتانە دەبینن و لێی دەڕوانن- ناوی ئەمانە نەزانن، بۆ ئەوەی، ئەوەی لەئێوە بێت و لەئێوە بووەشێتەوە و ئەوەی لەکەسانیتر بێت و لەوان بووەشێتەوە ، نەزانن، سزاوارتر و شیاوترن. ئەمە وتاری عەبدواللە کوڕی مەسعود و گێرانەوەی باوکی ساڵح لە عەبدواللە کوڕی عەباسە.

لە حسن و قتادە دەگێڕنەوە: کاتێك خوا فریشتەکانی لەدروست کردنی ئادەم و جێگری ئەو لە زەوی ئاگادار کردەوە، وتیان: ئایا لە زەوی کەسێك دادەنێیت خراپەکاری و خوێن رشتنی تیا ئەنجام بدات؟ فەرمووی: ئەو شتانە دەزانم ئێوە نایزانن. فریشتەکان بەیەکیان وت: رێگە بدەن خواوەندی ئێمە ئەوەی دەیەوێت دروستی بکات کە هەرگیز نافرێنراوێك ناٺافرێنێت مەگەرئەوەی ئێمە لای خوا لەو بەرێزتر و خاوەن پلەتر بین. کاتێك خوا ئادەمی بینی و فەرمانی بە فریشتەکاندا

کورنوشی بۆ ببەن، زانیان ئادەم لەوان باشتر ولای خوا بەرێزترە. فریشتەکان وتیان ئەگەر لەئێمە باشتر و لای خوا بەرێزتر بێت، ئێمە لەو زاناترین. کاتێك فریشتەکان شانازیان بە زانایی خۆیانەوە دەکرد، گیرۆدەی ئەم تاقیکردنەوە خواییە بوون کەخوا ناوەکانی فێری ئادەم کرد و دواتر خاوەن ناوەکانی بردە لای فریشتەکان و وتی: ئەگەر راست دەکەن، لەناوی ئەمانە ئاگادارم بکەنەوە. من کەسێك زاناتر و بەرێزتر لەئێوە دروست ناکەم. ئەوان تۆبەیان کرد و هەر باوەرداریێکیش بەرەو تۆبە و گەڕانەوە دەڕوات. فریشتەکان وتیان: خوایە پاکی و پەرستن شیاوی تۆیە. ئێمە زانابیمان نییە مەگەر ئەوەی تۆ فێرت کردوین چوونکە تۆ زانای فرەزانیت(بقرە/٢/٣٢). ئەم دووانە دەڵێن: خوا ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد لەئەسپەوە بگرە تا ئێستر، وشتر، پەرییەکان، ئاژەڵانی کێوی و دەشتەکی.

## بیرکردنەوەی مانەوەی ئادەم لە بەهەشت و دەرکردنی لەبەهەشت

بۆ فریشتەکان هەموو شتێکی ئیبلیس رونبوویەوە کە نەیاندەزانی کەهەمان گوناحکاری و نافەرمانی بوو. ئەو لەسەر گوناح پێداگری کرد و لەسەر گومرایی خۆی مایەوە. نەفرەتی خوای لێبێت. خوا ئەوی لەبەهەشت دەرکرد و لەخۆی دوور خستەوە و ئەوەی پێی بەخشیبوو— وەك پاشایەتی ئاسمان و زەوی و پاسەوانی بەهەشت— لێی سەندەوە. خوا پێی فەرموو: ((بڕۆرەدەر)) یانی لەبەهەشت بڕۆرەدەر چوونکە تۆ دوورخراوەیت و نەفرەتی من لەتۆ بێت تا رۆژی کۆتایی (ص/٣٨/ ٧٧—— ٧٨)

عەبدوالله کوڕی عەباس و عەبدوالله کوڕی مەسعود دەڵێن: کاتێك خوا ئادەمی لەبەهەشت جێگە کردەوە، ئەو بەتەنیا پیاسەی تیادەکرد و هاوسەری نەبوو تا لێی نزیك ببێتەوە و ئارام بگرێت. ماوەیەك خەوت و دواتر هەستا و ئەمجارە بینی ژنێك لەسەر سەری دانیشتووە. خواوەند ئەوی لەپەراسویەوە ئافراند. ئادەم لێی پرسی: تۆ کێیت؟ وتی: ژنم. ئادەم وتی: بۆ دروست کراویت؟ ژن وتی: بۆ ئەوەی لەمن نزیك ببیتەوە و ئارام بگریت. فریشتەکان دەیانوست ئاستی زانستی ئادەم بزانن. لەئادەمیان پرسی: ناوی چییە؟ ئادەم وتی: حەوا ((ژنی زیندوو)). فریشتەکان وتیان:

بۆ ناوی نراوە حەوا؟ ئادەم وتی: لەبەر ئەوەی لەپیاوێکی زیندوو (حی) ئافرێنراوە. خوا بە ئادەمی فەرموو: ئەی ئادەم تۆ لەگەڵ هاوسەرەکەت لە بەهەشتدا بمێننەوە و لەوێ لەهەر شوێنێك دەتانەوێت بەوپەری شادی و خۆشی بخۆن وبحەوێنەوە بەڵام لەو دارە نزیك مەبنەوە چوونکە ئەگەر ئەو کارە بکەن لەستەمکارانن. (بقره/٢/٣٥).

موجاهید و قتادە هاوشێوەی ئەمەیان گێراوەتەوە: کاتێك خوا ئادەم و هاوسەرەکەی لەبەهەشتدا جێگە کردەوە، ئەو دووانەی ئازاد کرد هەرچەندە دەخوازن لەمیوەکانی بەهەشت بخۆن مەگەر بەری یەك دار کە ویستی ئەوان بەمە تاقی بکاتەوە و فەرمانی خۆی لەبارەی ئەوان و منداڵەکانیان دەربکات. لەمکاتەدا دێو مەبەستی هەڵخەڵەتاندن و گومڕا کردنی ئەوانی کرد. بزوێنەری هاتن و گەشتنی ئەو بەو دووانە بەشێوەیەك بوو دەیویست بێتە ناو بەهەشت بەڵام پاسەوانەکان رێگەیان پێنەدا. ئەو رۆشتە لای هەموو ئاژەڵەکان و خۆی پێناساندن تا لەگەڵ خۆیاندا بۆ بەهەشتی ببەن بۆ ئەوەی لەگەڵ ئادەم و هاوسەرەکەی قسە بکات. بەڵام هەمووان خۆیان لەم کارە بەدوور گرت. رۆشتە لای مار و وتی: تۆ لە منداڵەکانی ئادەم پەنادەدەم و تۆ لە ژێر چاودێری مندا دەبیت ئەگەر بەرەو لای بەهەشت رێنوێنیم بکەیت. مار ئەوی لەناو دوو دیان لە دیانەکانی خۆی جێگە کردەوە و هاتە ناو بەهەشت. مار پێشتر لەسەر چواردەست و پێ دەرۆشت و یەکێك لەجوانترینی ئاژەڵەکان و لەوشتری خوراسانی دەچوو. خوا دەست وپێی لێسەندەوە روخساری بەشێوەیەك گۆڕی لەسەر سکی خۆی بەرێگادا بڕوات.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: لەهەر شوێنێك مارێکتان بینی بیکوژن و چاودێری دوژمنی خوا—ئیبلیس— لەسەر ئەو بشکێنن.

کاتێك ئیبلیس هاتە ناو بەهەشت، لەدەمی مار هاتە دەر. بەرادەیەك شین وگریانی دەسپێکرد کە ئادەم و حەوا بۆی ناراحەت بوون. پێیان وت: بۆ دەگریت؟ وتی: بۆ ئێوە دەگریم چوونکە دەمرن و لەم هەموو ناز و نیعمەتەی پێتان براوە دووردەکەونەوە. ئەم قسە کاریگەری لەسەر ئەو دوانە بەجێهێشت. ئەوسا ئیبلیس هاتە پێش و دەستی کرد بە هەڵخەڵەتاندنی ئەوان و وتی: ئەی ئادەم، ئایا دەتەوێت تۆ بۆلای داری جاویدان مانەوە((مانەوەی هەمیشەیی)) رێنوێنی بکەم و پاشایەتیەکی

درێژ بەروی تۆدا بکەمەوە کەهیچ کات کۆنی و کۆتایی روی تێنەکات؟ (طة/٢٠/١٢٠ ).
هەروەها وتی: خوا ئێوەی لەم دارە دوورنەکردەوە مەگەر تەنیا بۆ ئەوەی نەبنە فریشتە و بۆ هەمیشە لەبەهەشتدا نەمێننەوە. سوێندی خوارد کە من لە چاکەخوازان و چاك ئەندێشانی ئیوەم (اعراف/٧/٢٠-٢١) یانی بۆ ئەوەی ئێوە دوو فریشتە بن و ئەگەر دو فریشتە نەبن، بۆهەمیشە لەنیعمەتەکانی بەهەشت کەلك وەربگرن.
خوای گەورە دەفەرمێت: ئەوانی دابەزاند لەبەرزایی بەهەشت بۆ زەوی بە فریو (اعراف/٧/٢٢). کاریگەری وەرگرتنی حەوا لە هەڵخەڵەتاندنەکانی ئیبلیس زیاتر بوو. جارێك ئادەم داوای نزیك بوونەوەی لێ کرد، حەوا وتی: نا، مەگەر ئەوەی بێیتە ئێرە، کەرۆشتە ئەوێ وتی: نا رازی نابم تا لەم دارە – چڵی گەنم—نەخۆیت. ئەو دووانە لە بەری ئەو دارەیان خوارد و پاش و پێشی یەکیان بۆ ئاشکربوو. جل و بەرگی ئەوان هەموی نینۆك بوو، هەڵوەری  و تەنیا ئەوەی لێ مایەوە کەلەسەر پەنجەکانی دەست و پێ ماوەتەوە. دەستیان بە دانانی گەڵای دارەکانی بەهەشت لەسەر جەستەی روتی خۆیان کرد (اعراف/٧/٢٢ طة/٢٠/١٢١ ). دەڵێن ئەو گەڵایانە گەڵای دار هەنجیر بوو. دارێك ئادەم و حەوا لێیان خوارد بەشێوەیەك بوو هەر کەس لێی دەخوارد، خۆی پیس دەکرد. ئادەم دەستی بە راکردن کرد. خوا بانگی کرد: ئەی ئادەم، ئایا لەمن رادەکەیت؟ وتی: نە خواوەندا، بەڵام لەشەرمی تۆ رادەکەم. خوا فەرمووی: ئەی ئادەم، لەکوێوە زیانت بەرکەوتووە. وتی: لەحەوا. فەرمووی: پێویستە لەسەرمن هەر مانگ توشی خوێنبەربوونی بکەم و بێ ئاوزی بکەم هەرچەندە لەسەرمتاوە بەعاقڵ ئافراندم. وای لێدەکەم بەدژواری سکی پڕببێت و بە دژواری بزێت و هەزاران جار بکەوێتە سەر هەڵدێری مەرگ. لەسەرەتادا بەشێوەیەك ئافراندم بەئاسانی سکی پڕببێت و بەئاسانی بزێت. ئەگەر تاقی کردنەوەی ئەو نەدەبوو، ژنان خوێن بەربوونی مانگانەیان نەدەبوو و بەردەوام بەئاسانی دووگیان دەبوون و بەئاسانی منالیان دەهێنایە دنیا و بیرمەند و فەرزان دەبوون. خوای گەورە فەرمووی: بێ هیچ گومانێك، زەوییەك ژنی لێ دروست کراوە بە رادەیەکی وا نەفرەتی لێدەکەم هەموو بەر و میوەکانی ببنە چقڵ. لەوکاتەدا لەبەهەشت و

لەزەوی لە داری سەدر و داری چقڵ باشتر و چاکتر نەبوو. خوا بەماری فەرموو: ئەو دێوە سەرکۆنەکراوە بەنەفرەت کراوە هاتە ناو دەمی تۆ و بەندەکەی منی هەڵخەڵەتاند. تۆ نەفرەت لێکراوی، نەفرەتێك دەست و پێت بۆ سکت بگەڕێنێتەوە و جگە لە خۆڵ، خواردنت نەبێت. تۆ دوژمنی ئادەمیزادەکانی و ئەوان دوژمنی تۆن. هەر کات یەکێك لەوان ببینی پاژنەی دەگەزیت و هەرکام لەوان تۆ ببینێت، سەرت پان دەکاتەوە. دابەزن کەدەستەیەك لەنێوە دوژمنی ئەوانیترن ((هەمووتان دەبنە دوژمنی یەکتر. بقرە/٢/٣٦، اعراف/:٧/٢٤)). ئادەم، ئیبلیس و مار. خوا ئەوانی بۆ زەوی دابەزاند و هەموو ئەو رێز و حورمەتەی بە ئادەم و حەوای بەخشیبوو، لێی سەندنەوە.

مار لەهەموو ئاژەڵەکانی سارا کەخوا ئافراندبوونی وشیارتربوو، بەژنی وت: ئایا خوا بەراستی فەرموویەتی لە بەری هەموو دارەکانی باخ مەخۆن؟ ژن بەماری وت: لەبەری دارەکانی باخ دەخۆم بەڵام لەبەری ئەو دارەی لەناوەراستی باخدایە، خوا فەرموویەتی لەو دارە مەخۆن و دەستی لێمەدەن نەکا بمرن. مار بە ژنی وت: هیچ کات نامرن. بەڵکو خوا دەزانێت رۆژێك کەلەبەری ئەو دارە بخۆن چاوتان دەکرێتەوە و هاوتای خوا زانای چاك و خراپ دەبن. کاتێك ژن بینی ئەو دارە بۆ خواردن خۆشە و بەرواڵەت دارێکی جوان و دڵگیر و زانستزایە، لەبەرەکەی گرت و خواردی و بە مێردەکەیشی دا و ئەویش خواردی. ئەوکات چاوی هەر دوکیان کرایەوە و یەکتریان بەرووتی بینی. گەڵای داری ئەنجیریان پێکەوە بەست و شەرمی خۆیان پێ داپۆشی و ئاوازی خواوەندی خوایان بیست کە لەکاتی نەسیمی بەهار لەباخدا هەڵیکردبوو. ئادەم و ژنەکەی خۆیان لەترسی ئامادە بوون لەبەرامبەر خوا لەناو دارەکانی باخدا داشارد و خوا بانگی ئادەمی کرد و فەرمووی: لەکوێیت؟ وتی: کاتێك دەنگی تۆم لەناو باخدا بیست ترسام چوونکە رووتم و لەبەر ئەمە خۆم داشارد. فەرمووی: کێ تۆی لەرووتی خۆت ئاگادار کردەوە؟ ئایا لەودارەی تۆم لێ یاساغ کردبوو لێی نەخۆی، خواردت؟ ئادەم وتی: ئەم ژنەی بۆ منت دروست کرد، لەبەری ئەو دارە پێی دام و خواردم. خوا بە ژنی فەرموو: ئەمە چ کارێك بوو کردت؟ ژن وتی: مار منی هەڵخەڵەتاند. خوا بەماری فەرموو: لەبەر ئەوەی ئەمکارەت کرد لەکۆمەڵی

چوارپێکان و لەهەموو ئاژەڵەکانی سارا نەفرەت لێکراوتریت. لەسەر سکت بەرێگادا دەڕۆیت و هەموو تەمەنت خۆڵ دەخۆیت و دوژمنایەتی نێوان تۆ و ژن لەنێوان سرشتی تۆ و سرشتی ژندا دادەنێم. ئەو سەری تۆ پان دەکاتەوە و تۆ پاژنەی ئەو دەگەزیت. بە ژنی فەرموو: ئازار و سکپڕی تۆ زیاد دەکەم. بە ژانەوە منداڵت دەبێت و تامەزرۆیی تۆ بۆ مێردەکەت دەبێت و فەرمانبرداری ئەو دەکەیت. بەئادەمی فەرموو: لەبەر ئەوەی گوێت لەقسەی ژنەکەت گرت و لەو دارەت خوارد کە فەرمانم دابوو لێی نەخۆیت، لەبەر تۆ زەوی بەنەفرەت کرا و هەموو تەمەنت رەنجی لێدەبەیت. چقڵ و درکیشت بۆ دەروێنێت و سەوزەڵانی سارا دەخۆیت. بەئارەقی ناوچاوت نان دەخۆیت تا ئەو کاتەی بۆ خاك دەگەڕێیتەوە کەلێی ئافرێنراوی چوونکە تۆ خاکیت و بۆ خاك دەگەڕێیتەوە. ئادەم ناوی ژنەکەی خۆی نا حەوا چوونکە دایکی هەموو زیندووەکانە. خوا جل و بەرگی بۆ ئادەم و ژنەکەی لە پێست دروست کرد و ئەوانی پێ داپۆشی. فەرمووی: مرۆڤ بۆتە هاوشێوەی ئێمە و بۆتە زانای چاك و خراپ. ئێستا نەکا دەستی خۆی درێژبکات و لە داری ژیانیش بخوات و بۆ هەمیشە بەزیندویی بمێنێتەوە. لەبەر ئەمە خواوەند ئەوەی لە باخی عەدەن دەرکرد. ئادەمی دەرکرد و بەرەو لای رۆژهەڵات رەوانەی کرد و شمشێرێکی ئاگراوی بۆ هەر لایەك دەسوراند تا رێگەی داری ژیان بپارێزێت. (عەهدی عەتیق، سەفەری دەرکەوتن، بەشی ٣، ئایەی ١ـــ٢٤ ))))

دەڵێن: سەعید کوڕی موسەییب بەردەوام سوێندی دەخوارد کەئادەم لەکاتی وشیاریدا لەو دارەی نەخواردووە بەڵکو حەوا شەرابی دەرخوارددا و مەستی کرد، ژن ئادەمی بۆ لای دارەکەی برد و ئادەم لەو دارەی خوارد.

دەڵێم: سەرسورهێنەرە لە سەعید کەئەم قسەی هێناوەتە سەرزمان لەگەڵ ئەوەی خوا لەوەسف کردنی شەرابە بەهەشتیەکان دەفەرمێت: ئەو شەرابانە نەژانە سەریان بەدوادا دێت و نە ئەو کەسانەی لێی دەخۆنەوە، مەست دەبن. ((صافات/٣٧/٤٧))

## بیرکردنەوەی ڕۆژێك ئادەم ڕێگەی مانەوەی لە بەهەشت پێدرا و ڕۆژێك کە لێی دەرکرا و ڕۆژێك کەتۆبەی کرد و بۆ لای خواوەند گەڕایەوە

باوکی هورەیرە لەپێغەمبەر (د.خ) دەگێڕێتەوە کەفەرمویەتی: باشترین ڕۆژ کەهەتاو تیایدا تیشك بلاوبکاتەوە ڕۆژی هەینییە. ئادەم لەم ڕۆژەدا لەبەهەشت مۆڵەتی مانەوەی پێدرا و لەم ڕۆژەدا لەبەهەشت دەرکرا و لەم ڕۆژەدا خوا لێی خۆشبوو و لەم ڕۆژەدا کۆتایی بەدنیا دێت. لەم ڕۆژەدا کاتژمێرێك هەیە – کەکەمتر کەسێك دەستی پێی دەگات یا دەردەکەوێت– چوونکە هیچ بەندەیەکی موسوڵمان هەستی پێناکات و تیایدا لە خوا شتێکی نەوێت، مەگەر ئەوەی خوا خواستەکەی بۆ بێنێتەدی.
عەبدوالله کوڕی سەلام دەڵێت: دەزانم ئەم کاتژمێرە کامەیە. دوایین چرکەکان لەڕۆژی هەینییە.

### (( ئەندازەی مانەوەی ئادەم لە بەهەشت ))

باوکی عالیە دەڵێت: ئادەم لەکاتژمێری نۆیەم یا دەیەم لەبەهەشت دەرکرا و نۆ کاتژمێر تێپەری و لەو ڕۆژە بۆ زەوی دابەزی و مانەوەی لەبەهەشت پێنج کاتژمێربوو. دەستەیەك دەڵێ: سێ کاتژمێر لەو ڕۆژە بوو.
ئەگەر بێژەری ئەم وتارە ویستبێتی بڵێت ئادەم بۆ ئەو دوو کاتژمێرەی کە لەڕۆژی هەینی تێپەری، لەبەهەشتدا مایەوە و ئەم دوو کاتژمێرە لەو کاتەدا بەم شێوەی ئەمڕۆ بوون، وتەکەی لە ڕاستییەوە دوور نابێت چوونکە بەسەرهاتەکان لەڕابردووانی بیرمەند و وزانا بەم شێوە ئاماژەیان پێدراوە: ئادەم لەدوایین کاتژمێرەکان لەڕۆژی شەشەم ئافرێنرا ((لەو ڕۆژانەی)) ئەندازەی ئەوان هەزار ساڵ لەساڵەکانی ئێستای ئێمە بوو. کەواتە زانیویەتی یەك کاتژمێر لەو ڕۆژە بەرابەر بە ٨٣ ساڵ لەساڵەکانی ئێستای ئێمە بووە. ئێمە ئاماژەمان پێدا کەئادەم – دوای ئەوەی

خوا قوڕەکەی گرتەوە و پێش ئەوەی گیان بکاتە بەری– چل ساڵ مایەوە. گومانی تیا نییە بێژەری ئەم بەسەرهاتە، مەبەستی چل ساڵ لەساڵەکانی ئێمە بووە. ئەوسا دوای ئەوەی گیانیان کردە بەری تا ئەو کاتەی کارەکەی کۆتایی پێهات و لە بەهەشتدا مایەوە و بۆ زەوی دابەزی (( سی و پێنج ساڵ تێپەری ))دوور نییە ئەندازەی ئەو سی و پێنج ساڵە بە ئەندازەی ساڵەکانی ئێستای ئێمە بێت. ئەگەر بێژەر ویستویەتی بڵێت بۆ ئەو دوو کاتژمێرەی لەرۆژی هەینی تێپەری(( لەرۆژێك کەهەر کامیان بەرامبەر بەهەزار ساڵ لەساڵەکانی ئێمەن)) لەبەهەشتدا مایەوە، هەڵەی کردووە چوونکە هەموو ئەو کەسانەی لەمبارەوە خاوەن ڕا و زانستخوازن، دەڵێن لەکۆتایی رۆژی هەینی پێش ئاوابوونی خۆر، گیان بەئادەم بەخشرار. باوکی ساڵح لەعەبدوالله کوڕی عەباس دەگێرێتەوە کەئادەم نیوە رۆژێك لەبەهەشتدا مایەوە و لەوکاتەدا هەر رۆژ بەرامبەر بە پێنسەد ساڵ بوو ((کەواتە ئەو ٢٥٠ ساڵ لەبەهەشتدا مایەوە. ئەمەیش بەپێچەوانەوەی ئەو گێرانانەوەیە کە پێغەمبەر(د.خ) و زاناکان ئاماژەیان پێداوە.

## ئاماژەدان بەو شوێنەی ئادەم و حەوا لێی دابەزین

دەڵێن: خوای گەورە ئادەمی پێش ئاوابوونی هەتاو لە رۆژێك ك ئەوی تیا دروست کرد ((هەمان رۆژی هەینییە)) هاورێ لەگەڵ ژنەکەی لە ئاسمان دابەزاند. علی کوڕی ئەبی تالیب و عەبدوالله کوڕی عەباس و قتادە و باوکی عالیە دەڵێن: ئەو لەهیند لەسەر کێوەێك بەناوی ((نود))دابەزێنرا. حەوا لەجەدە دابەزێنرا.
عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: ئادەم بە دوای حەوادا گەرا. هەر شوێنێك هەنگاوی هەڵدەگرت دەبووە دێهات و نێوان دو هەنگاوەکەی دەبووە بیابان.
ئەو رێگای بڕی تاگەشتە ((جمع)) و لەم کاتەدا بوو حەوا لێی نزیك بوویەوە و لەبەر ئەمە ئەویٚ بە ((مۆزدەلیفە))((شوێنی کۆبوونەوە)) ناوبرا. ئەو دووانە لەعەرەفات یەکیان ناسی و بەعەرەفات((شوێنی یەك ناسین)) ناوی دەرکرد و لە((جمع)) پێکەوە کۆبوونەوە و لەبەر ئەمە جمع بە شوێنی کۆبوونەوە ناودەبرێت.

مار لە ئیسفەهان دابەزێنرا و ئیبلیس لەمیسان. دەوترێت ئیبلیس لە((ئۆبوولە)) و ئادەم لە بیابان دابەزێنران.

ئەبوو جعفري طبري دەڵێت: ئەمە شتێکە ناتوانین بە تەواوی لەراستییەکەی دڵنیا بین مەگەر بەحەدیس یا گێرانەوەیەك کەپشت راست کرابێتەوە و لەمبارەوە هیچ زانیاریەکمان لەبەردەستا نییە جگە سەبارەت بەدابەزینی ئادەم لە هیند کەزانایانی ئیسلامی راستی ئەم گێرانەوە رەد ناکەنەوە. عەبدوالله کوری عەباس دەڵێت: کاتێك ئادەم لەکێوی نود دابەزی، قاچەکانی لە سەر زەوی بوو، سەری لە ئاسمان دەسوو و پەرستن و پارانەوەی فریشتەکانی دەبیست و فریشتەکان ترسی ئەویان لە دڵدا بوو. ئادەم داوای لەخوا کرد درێژییەکەی کورت بکاتەوە. خوا درێژی ئەوەی تا شەست گەز کەم کردەوە. ئادەم لەوەی لەدەستی دابوو—بیستنی دۆعا و پارانەوەی فریشتەکان—خەمبار بوو و وتی: خواوەندا من، بەندەی تۆ لەماڵەکەتدا بووم و خوایەکم جگە لەتۆ نییە. منت بردە بەهەشتەکەی خۆت و هەر شتێکم بوویستایە لەوێ دەمخوارد. منت لەم کوێستانە پیرۆزە دابەزاند و ئاوازی فریشتەکان و بۆنی بەهەشتم دەکرد. ئێستا تۆ درێژی بالآمت تا شەست گەز کەم کردەوە و روانین و بیستنت لەمن سەندەوە و بۆنی بەهەشت کۆچی کرد. خوای گەورە وەلآمی دایەوە. ئەی ئادەم ، لەبەر گوناحەکەت بوو، ئەم بەلآیەت بەسەرداهات.

کاتێك خواوەندی گەورە رووت و قوتی ئادەم و حەوای بینی: فەرمووی مەرێك لەناو هەشت جووت گامێش و مەر کە خوا لەبەهەشتەوە ناردبووی، سەر ببرێت. ئادەم مەرەکەی گرت و سەری بری و خورییەکەی هەڵگرت. حەوا خورییەکەی رست و ئادەم لەخوریيە رستراوەکە بۆ خۆی بالآپۆشێك و بۆ حەوا کراس و لەچکی لێ دروست کرد و خۆیان پێ داپۆشی.

دەگێرنەوە: خواوەند فریشتەیەکی بۆلایان نارد تا فێریان بکات بۆ خۆیان لە پێستی مەر و چوارپێکان جل وبەرگ دروست بکەن. هەروەها دەڵێن: ئەوەی وتراوە جل و بەرگی منداڵەکانیان بوو بەلآم ئادەم و حەوا بەگەڵای دارەکانی بەهەشت خۆیان دادەپۆشی.

((ئەوەی گومان دەکەن ئادەم ماڵی خوای دروست کردووە)

خوا خستییە دڵی ئادەمەوە: بارەگایەکەم لەبەرامبەر عەرشەکەمدا هەیە. برۆ و لەوێ ماڵێك بۆ من دروست بکە و بەدەوریدا بسوڕێرەوە، بەهەمان شێوە کەبینیت فریشتەکان بەدەوری عەرشەکەمدا دەسوڕێن. لەو کاتەدا هەر کەس لەنێوان تۆ و منداڵەکانی تۆ کەفەرمانبرداری من بن، دۆعاکانیان بەراوەردە دەکەم. ئادەم وتی: خواوەندا، چۆن دەتوانم ماڵێك دروست بکەم کەهێزەکەیم نییە و ڕێگەی دروست کردنی نازانم؟ خوا فریشتەیەکی نارد. ئادەمی هەڵگرت و بەرەو مەکە بەڕێکەوت. لەڕێگا هەر شوێنێك ئادەم بیستانێکی دەبینی بەفریشتەی دەوت: ئێمە لێرە دابەزێنە و فریشتە دەیوت: خۆراگر بە. سەرئەنجام لەمەککە دابەزی. هەر شوێنێك ئادەم دادەبەزی ئاوەدان دەبوویەوە و جگە لەوە دەبووە بیابان.؟ ئادەم کەعبەی لەپێنج کێو دروست کرد: طور سینا، طور زیتا، لبان، جودی و پایەکانی لە حەرا دروست کرد. کاتێك لە دروست کردنی ماڵەکە تەواو بوو، فریشتە بەرەو عەرەفاتی برد و ئەوی فێری ڕێ و رەسمی حەج کردن کرد بەو شێوەی ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن. دواتر ئەوەی بردە مەککە و ئادەم بۆ ماوەی یەك حەفتە بە دەوری کەعبەدا سووڕایەوە و دواتر بۆ هیند گەڕایەوە و لەسەر کێوی نود مرد.

بە پێی ئەم گێڕانەوەیە، ئادەم و حەوا پێکەوە دابەزێنران و ئادەم ماڵی خوای دروست کرد و ئەمە بەپێچەوانەی ئەو گێڕانەوەیە کە بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین کەدەڵێت: ماڵی خوا لە ئاسمانەوە دابەزێنرا.

دەڵێن: ئادەم چل جار بەپێ لەهیندەوە حەجی کردووە.

کاتێك لە هیند دابەزی، لەسەر سەری تاجێك لە دارەکانی بەهەشت بوو. کاتێك گەشتە زەوی گەڵاکانی وشك بوون و هەڵوەرین و بەم هۆیەوە هەموو جۆرە گوڵ و گیایەکی بۆنخۆش لەهیند ڕوا و سەوز بوو. دەڵێن: گوڵ و گیای بۆنخۆش بەهۆی ئەو گەڵایانەوە بوو ئادەم و حەوا لەبەهەشت هەڵیان گرت و کردیانە جل و بەرگ بۆخۆیان. دەڵێن: کاتێك فەرمانی پێدرا لەبەهەشت بڕواتەدەر، لەهیچ دارێکی باخی بەهەشت تێپەڕ نەبوو مەگەر ئەوەی لقێکی لێکردەوە و لەگەڵ خۆیدا بۆ سەر زەوی هێنا. بەمشێوەیە هیند بوو بەسەرزەمینی ڕوانی گوڵ و گیای بۆنخۆش. خواوەند

لەمیوە بەهەشتیەکان توێشوی پێدا و میوەکانی ئێستای ئێمە لەمیوە بەهەشتیەکانن بەو جیاوازییەی میوەکانی ئەم دنیایە ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا دێت و میوەکانی بەهەشت نا. خواوەند دروست کردنی هەموو شتێکی فێر کرد و هەندێ شتی بۆنخۆش و خۆش بۆنکەری لەگەڵدا نارد. هەروەها بەردی رەش ((الحجر السود)) لەگەڵدا نارد. ئەم بەردە لەبەفر سپیتر بوو. لەگەڵ ئەودا گۆچانەکەی موسی نارد کە لەکاژی بەهەشت دروست کرابوو. دوای ئەوە سندان و چەکوش و پلایزی دابەزاند.

ئادەم زۆر جوان بوو. لەناو منداڵەکانی خۆی تەنیا یوسف لەو دەچوو.

جبرەئیل هاتەلای و هەنبانەیەك پڕ لەگەنمی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئادەم وتی: ئەمە چییە؟ جبرەئیل وتی: ئەو بەرهەمەیە بووە هۆکاری دەرکردنی تۆ لەبەهەشت. ئادەم وتی: چی پێبکەم؟ جبرەئیل وتی: لە زەویدا بیچێنە. ئادەم ئەو کارەی کرد ولەهەمان کات خوا ڕواندی. ئادەم دروێنەی کرد و کۆی کردەوە، خەرمانی کرد و کوتای و بەبایدا و کردی بەئارد و هەویری دروست کرد و کردی بەنان. جبرەئیل ئەم کارانەی فێر دەکرد. جبرەئیل بەرد و ئاسنی بۆ هێنا. بە بەرد و ئاسن ئاگری پێکرد. جبرەئیل فێری ئاسنگەری و جوتیاری کرد و مانگایەکی لەئاسمان بۆ هێنایە خوار کە زەوی پێدەکێلا. دەڵێن: ئەمە ئەو بەدبەختیانەیە خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژەی پێداون: نەکەن ئێوە دوانە دێو لەبەهەشت دەرتان بکات چوونکە بەدبەخت دەبن(طة ٢٠/١١٤). خواوەند ئادەمی لەکێو هێنایە خوار ونەوی کردە سەروەری هەموو زەوی بەپەری و باڵندە و چوارپێ و هەموو شتەکانیتر. ئادەم لەدەرگای خواوەند پارایەوە و وتی: خواوەندا ئایا لەسەر زەوی جگە لەمن کەسێك نییە تۆ بپەرستێت و وەسفی تۆ بکات؟ خوای گەورە فەرمووی: لەپشتی تۆ کەسانێك دروست دەکەم بمپەرستن و وەسفم بکەن. لەسەر زەوی چەندین ماڵ دروست بکەم تایبەت بە بیرکردنەوەی من و لە شوێنێکی زەوی ماڵێکی تایبەت بەخۆم دروست دەکەم و دەیکەمە بارەگایەکی ئارام و ئەمن. هەرکەس لەبەر من ڕێز لەوماڵە بگرێت، ڕێزی لێدەگرم و هەرکەس خەڵکانی ناوی بترسێنێت، بەڵێنی منی شکاندوە و ڕێزی بارەگاکەمی پێشێل کردووە. ئەمە یەکەم ماڵە بۆخەڵك بناغەی دارێژرابێت. هەر کەس ڕوی تێکات و مەبەستی شوێنێکیتر نەکات، هاتۆتە لای من وسەردانی منی کردووە و بۆ میوانی من هاتووە.

لەسەر گەورەکان پێویستە رێز لەمیوانان و سەردانکەرانی خۆیان بگرن و نیازەکانیان بەراوەردە بکەن. تۆ ئەی ئادەم، تا ئەو کاتەی زیندوویت بەئاوەدانی رایدەگریت. ئەوکات خەڵکان و دەستەکان و ئەو پێغەمبەرانەی لەمناڵەکانی تۆبن، یەك لەدوای یەك ئاوەدان رایدەگرن.

ئەوسا فەرمانی بەئادەمدا زیارەتی بیت الحرام بکات. ئادەم لەبەهەشت یاقوتێکی تاقانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. بیت الحرام ئاوەدان بوو تا ئەوساتەی خوا خەڵکی نوحی لەناوبرد و نوقمی کردن بەلام بناغەی ئەم ماڵە لە شوێنی خۆیدا مایەوە تا ئەوەی خوا کردی بەشوێنی ئیبراهیم و ئیبراهیم دروستی کردەوە و سەرلەنوێ ئاوەدانی کردەوە بەهەمان شێوە کەبەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

ئادەم بە مەبەستی حەج و تۆبەکردن بەرەو ماڵی خوا بەرێکەوت. خۆی و ژنەکەی حەوا بۆ گوناحەکانی خۆیان و ئەوەی لەبەهەشت لەدەستیان دابوو، بۆ ماوەی دوسەد ساڵ گریان و چل رۆژ لەخواردن و خواردنەوە خۆیان بە دوور گرت و دواترخواردیان و خواردیانەوە. ئادەم سەد ساڵ لەگەڵ حەوا نزیکی نەکرد. حەجی کرد و لەخوا چەندین قسە فێربوو. خوا ئەوی لەگەڵ ئەواندا بەخشی و ئەمە ئەو بابەتەیە خوای گەورە فەرمویەتی: خواوەندا، ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد و ئەگەر لەئێمە خۆش نەبیت و خۆشەویستی خۆتمان پێنەبەخشیت، بێ گومان لەزیانکاران دەبین.(اعراف/٧/٢٣).

## دەرهێنانی مناڵانی ئادەم لە پشتی و وەرگرتنی پەیمان

سەعید کوڕی جوبەیر لەعەبدوالله کوڕی عەباس دەگێڕێتەوە: خواوەند لەهەموو مناڵانی ئادەم لەجێگەی ((نەعمان)) لەعەرەفە پەیمانی وەرگرت. کەواتە هەموو ئەو کەسانەی تا رۆژی کۆتایی چاو بەدنیا هەڵدێنن، لەبەرامبەر ئادەمدا کۆکردەوە و بەشێوەی تەپۆڵکەی تۆز، روبەروی کردەوە و روبەروو قسەی لەگەڵ ئەواندا کرد و فەرمووی: ئایا خواوەندی ئێوە نیم؟ وتیان ، بەڵێ خواوەندی ئێمەیت و شایەتی دەدەین. خواوەند ئەم کارەی کرد تا لەرۆژی کۆتایی نەڵێن: ئێمە بێ ئاگا بووین. تا

نەڵێن: باوکانی ئێمە بتپەرست بوون و ئێمە زادەی دووای ئەوانین. ئایا ئێمە بەکرداری خراپەکارن سزا دەدەیت؟ (اعراف/ ٧/١٧٢—١٧٣)

دەڵێن: لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: خواوەند لەشوێنێك بەناوی دەحنا پەیمانی لێ وەرگرتن.

سەدی دەڵێت: خواوەند ئادەمی لەبەهەشت دەرکرد بەلاّم ئەوەی لەئاسمان بۆ زەوی دانەبەزاند. ئەوسا دەستی بەسەر شانی راستی ئەودا کێشا و منالّەکانی بە شێوە کۆپەلّە گەوهەری سپی رەنگی خۆلّ ئاسا هێنایە دەر و فەرمووی: لەسەر بنەمای خۆشەویستی من وەرنە ناو بەهەشت. ئەوسا دەستی لەشانی چەپیدا و کۆپەلّەیەکی رەش رەنگ هاتنە دەر و خوا پێی فەرموون: برۆنە ناو جەهەننەم و لەکەس ناترسم. ئەمە ئەو بابەتەیە لەقورئان بەناوی راست دەستەکان و چەپ دەستەکان یادی دەکرێتەوە ( واقعە/ ٥٦/٢٧، ٣٨، ٤١). خوا پەیمانی لێ وەرگرتن و فەرمووی: ئایا خوای ئێوە نیم؟ وتیان: بەڵێ خوای ئێمەیت. هەندێ بەدڵ و خوازیارانە وتیان و هەندێ لە ترسا.

## روداوەکانی رۆژگاری ئادەم لەم دنیایە

## (( کوشتنی کوری ئادەم بە دەستی براکەی خۆی ))

یەکەم روداو، کوشتنی هابیل کوڕی ئادەم، بەدەست براکەی خۆی قابیل بوو. زاناکان لەبارەی ناوی قابیل بیروڕای جیاوازیان هەیە: دەستەیەك دەڵێن قین و دەستەیەك دەڵێن قایین و دەستەیەك دەڵێن قاین و دەستەیەك دەڵێن ناوی قابیل بوو.

لەبارەی هۆکاری کوشتنەکەی بیروراکان جیاوازن. دەڵێن: هۆکارەکەی ئەوە بوو ئادەم پێش دەست بردن بۆ گوناح، لەبەهەشت لەگەڵ حەوا نزیکی دەکرد. حەوا بە قابیل دووگیان و هاوتاکەی کچێکی جوان و ناسك بوو کە لەهەمان کات بەویش دووگیان بوو. حەوا لەم دووگیانییە هیچ ئازار یا ماندووی و پشت ئێشە و ئازاری ژان گرتن و منالّ هێنانە دنیایی پێ نەبرا. هەروەها خوێنیشی نەبینی چوونکە بەهەشت لەم شتانە پاکە. کاتێك ئەو دووانە لەدارەکەیان خوارد و بۆ زەوی دابەزین و ئارامیان گرت، ئادەم لەگەڵ حەوا نزیکی کرد و حەوا بە هابیل و کچێکیتر دووگیان بوو. حەوا لەکاتی بەدنیا هێنانی ئەوان ئازار و پشت ئێشە و ژانی بەخۆوە بینی و توشی خوێنبەربوون بوو. لەسەر ئەم بنەمایە دەڵێن: حەوا بەردەوام سکی بە کوڕ و کچێك پڕدەبوو. ئەو بۆ ئادەم لە نێر و مێ چل منالّی هێنایە دنیا لەبیست سك. هەر کام لە کورەکان لەگەڵ هەر کچێکدا بیویستایە جگە لەهاوتاکەی خۆی پەیوەندی ژن و مێردایەتی دەبەست. کچێك کە بەسکێك لەگەڵ کوڕێکدا چاوی بەدنیا هەڵدەهێنا بۆ ئەو حەرام بوو. ئەمەیش لەبەر ئەوە بوو لەو کاتەدا جگە لەدایك و خوشکەکان هیچ ژنێکی دیکە بوونی نەبوو. ئادەم فەرمانی بە قابیلی کوری دا هاوتاکەی هابیل بۆ ژنی هەڵبژێرێت و بە هابیل فەرمانیدا هاوتاکەی قابیل بکاتە هاوسەری خۆی.

دەڵێن: داستانەکە بەم شێوە نەبووە بەڵکو کاتێك ئادەم ویستی بۆ گەشت و گوزار بڕوات، بەئاسمانی وت: منالّەکانی من وەك ئەمانەت لای خۆت بپارێزە. ئاسمان خۆی لەم کارە بەدوور گرت. بە کێو و زەویشی وت و ئەوانەیش خۆیان بەدوور گرت. ئەم پێشنیارەی خستە بەردەم قابیل، وەلآمی دایەوە: بەڵێ ئەم کارە دەکەم وکاتێك

دەگەڕێیتەوە شتێك دەبینیت شادمانی تۆی بەدواوە دێت. لەبارەی ئەم داستانەوەیە خوای گەورە فەرمویەتی: ئێمە ئەمانەتمان بە کێو و ئاسمانەکان سپارد بەڵام ئەوان لەهەڵگرتنی خۆیان بە دوور گرت و ترسان. ئادەم هەڵیگرت و ئەم ئادەمە ستەمکار و نەزانە. (احزاب/٣٣/٧٢)

کاتێك ئادەم لەبارەی هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکەکانی ئەم بڕیارەیدا، هابیل لەبەرابەر ئەم بڕیارە سەری دانەواند و پێی رازی بوو بەڵام قابیل بەکارێکی ناڕەوای لەقەڵەمدا و خوشکەکەی هابیلی پەسەند نەکرد.حەزی لەخوشکە هاوتاکەی خۆی بوو. وتی: من و خوشکەکەم لە بەهەشت لەدایك بووین و هابیل و خوشکەکەی لە زەوی، لەبەر ئەمە من شیاوترم بۆ خوشکەکەم.

دەستەیەك لەزاناکان دەڵێن: خوشکی قابیل لەجوانترینی ژنان بوو و ئەو پەسەندی نەدەکرد خوشکەکەی بکاتە هاوسەری هابیل ، ئەوی بۆخۆی دەویست چوونکە هابیل و خوشکەکەی لەبەهەشت لەدایك نەببوون بەڵکو زادەی زەوی بوون و خوا زاناترە. ئادەم پێی وت: کوڕم هاوتای خۆت بۆ تۆ حەڵاڵ نییە بەڵام بەقسەی ئادەم رازی نەبوو. باوکی پێی وت: کوڕم، تۆ قوربانییەك بۆ بارەگای خوا هەڵبگرە و براکەیشت هابیل قوربانییەك بۆ بارەگای خوا هەڵدەگرێت. هەر کام لەنێوە خوا بەقوربانییەکەی رازی بوو شیاوترە بۆ هاوسەری ئەم کچە. قابیل لەسەر زەوی کاری دەکرد و هابیل ئاژەڵداری. قابیل دەستەیەك گەنمی وەك قوربانی بەرز کردەوە و هابیل مەڕێك لەناو ڕانە مەڕەکەی خۆی ئامادە کرد. دەڵێن: ئەو مانگایەکی پێشکەش کرد. خوا ئاگرێکی سپی نارد و قوربانییەکەی هابیلی قووتدا و قوربانییەکەی قابیلی لە شوێنی خۆیدا بەجێهێشت. لەوکاتەدا ئایینی خوایی بەم شێوەبوو و قوربانی بەم شێوەیە وەردەگیرا. کاتێك خوا بە قوربانییەکەی هابیل رازیبوو—و ئەمەیش فەرمانێك بوو تا ببێتە هاوسەری خوشکە جوانەکەی قابیل— قابیل تووڕە و زیاتر لەخۆبایی بوو، شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو، بەبراکەی خۆی وت: بێ گومان دەتکوژم تا نەبیتە هاوسەری خوشکەکەم. هابیل وتی: خوا قوربانی چاکەکاران وەردەگرێت و بەس. قابیل شوێن هابیل کەوت و ئەوی لەکاتی شوانیدا

گوشت.

ئەم داستانە خوا لەقورئاندا بەم شێوە باسی کردووە: بۆ ئەوان بەسەرهاتی دو منالەکەی ئادەم بەراستی بخوێنەرەوە کە هەردوو قوربانیان پێشکەش کرد و خوا بەقوربانی یەکێکیان رازی بوو. ئەویتر وتی: بە ناچار دەتکوژم. ئەویتر وەڵامی دایەوە: خواوەند تەنیا بەقوربانی چاکەکاران رازی دەبێت. ئەگەر دەست بۆ کوشتنی من درێژ بکەیت، من دەستەکانم بۆ کوشتنی تۆ درێژ ناکەم. من لەخوا دەترسم کەخواوەندی جیهانیانە. دەخوازم بگەرێیتەوە و گوناحی من و گوناحی خۆت بەشان هەڵبگریت تا لەجەهەننەمیان بیت و پاداشتی ستەمکارن ئەمەیە. ئازایەتی جەستەی ئەو، رێگەی کوشتنی براکەی بۆ تەخت کرد و براکەی خۆی کوشت و کەوتە ریزی خراپەکاران. لەم کاتەدا خوا قەلەرەشەیەکی نارد. قەلەرەش لەسەر زەوی خۆڵی هەڵدەگرت تا نیشانی بدات چۆن جەستەی براکەی خۆ لە خاکدا بشارێتەوە. وتی: هاوار لەمن، ئایا ناتەوانم هاوشێوەی ئەو قەلەرەشە بم وجەستەی براکەی خۆم لەخاکدا بشارمەوە؟ پەشیمان بوویەوە ((مائدە/٥/٢٧ــــ٣١). خوا دوواهاتی ئەم براکوژییە بەم شێوەیە باس دەکات: لەبەر ئەمە بوو بۆ منالەکانی ئیسرائیلمان نوسی هەر کەس، کەسێك بێ تاوان بکوژێت یا بێ گوناح خوێنی کەسێك لەسەر زەوی برێژێت، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێت و هەر کەس کەسێك زیندوو بکاتەوە وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکان زیندوو بکاتەوە. نێردراوانی خوا بە نیشانەی رون و ئاشکرا هاتنە لای ئەمان و لەگەڵ ئەمەیشدا، دوای ئەوان بوون بە فشەکەران لەسەر زەوی ((مائدە/٥/٣٢)

دەڵێن: ئەمە یەکەم کوژراو لەمنالەکانی ئادەم بوو. کاتێك براکەی کوشت، خوای گەورە فەرمووی: ئەی قابیل، براکەت هابیل لەکوێیە؟ وتی: نازانم چوونکە پاسەوانی ئەو نەبووم. خوای گەورە فەرمووی: تۆ لە لایەن زەوییەوە نەفرەتت لێکراوە کەدەمی کردەوە و خوێنی براکەتی خوارد. ئەگەر شتێك لەزەویدا بچێنیت زەوی هیچت پێنادات و لەسەر زەوی سەرگەردان و ترساو دەبیت. قابیل وتی: ئەگەر لە گوناحەکەی من خۆش نەبیت، گوناحێکی گەورەم دەبێت.

دەڵێن: کوژرانی ئەو لە نزیك ((عەقەبەی حەرا) بوو.

دەڵێن: دواتر قابیل گەڕایەوە و دەستی خوشکەکەی خۆی گرت و بۆ سەرزەوینی عەدەن لەیەمەن رایکرد.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك براکەی کوشت، دەستی خوشکەکەی گرت و لەگەڵ ئەو بۆ کێوی نود رایکرد. ئەوسا ئادەم پێی وت: بڕۆ، بەردەوام ترساو دەبیت و کەس نابینیت لای ئەو هەست بەئاسایش بکەیت. ئەو لای هیچ کام لە منداڵەکانی خۆی تێپەر نەدەبوو مەگەر ئەوەی بەردیان هەڵدەگرت و تێیان دەگرت. دواتر کوڕێکی کوێر لەقابیل هاوڕێ لەگەڵ کورە کوێرەکەی خۆی رویکردە قابیل و ئەمیان بەباوکی خۆی وت: ئەمە باوکی تۆ قابیلە، شتێکی بۆ بهاوێژە. ئەویش ئەم کارەی کرد و باوکی خۆی قابیلی کوشت. ئەوسا کوێرەکە دەستی بەرز کردەوە و لە کورە کوێرەکەی خۆیدا و ئەویشی کوشت. لەم کاتەدا هاتە خۆی و وتی: هاوار لەمن ، باوکم بە بەرد کوشت و کورەکەم بە مشت.

کاتێك هابیل کوژرا، تەمەنی ژیانی بیست ساڵ و قابیل بیست و پێنج ساڵی بوو. حەسەن دەڵێت: ئەو دوو پیاوەی خوا بەسەرهاتی ئەوانی لە سورەی ((مائدە٢٧/٥—٣١)) ئاماژە پێداوە، لەئیسرائیلیەکان بوون و لەپشتی ئادەم خۆی نەبوون و ئەمە یەکەم مرۆڤ کوژی بوو. ئەبوو جەعفەری تەبەری دەڵێت: گێرانەوەی راست لای ئێمە ئەوەیە کە ئەو دووانە لەپشتی ئادەم خۆی بوون و ئەمە لەسەر بنەمای حەدیسێکی راستە لەپێغەمبەرە(د.خ) کە فەرموویەتی: هیچ کەس ستەم لەکەسێکیتر ناکات مەگەر ئەوەی بەشێکی لە گوناحی یەکەم کوڕی ئادەم پێبڕابێت چوونکە ئەو یەکەم کەس بوو شێوەی چەوتی خەڵك کوشتنی هێنایە ئاراوە.

بەڵگەی ئەوەی ئەو لەمناڵەکانی ئادەم بوو، ئەو بابەتەیە لەشیکردنەوەی ئەم فەرموودەی خوای گەورە ئاماژەی پێدەدەن کەدەفەرمێت: ئەو هەمان خوایە ئێوەی لەیەك جەستە دروست کرد و هاوسەرەکەی لەخۆی ئافراند تا لای ئەو ئارام بگرێت .

کاتێك ئادەم بەو ژنە گەشت و لێی نزیك بوویەوە، ژن بارێكی سووكی هەڵگرت و لەگەڵیدا رۆشت. کاتێك ژن باری قورس بوو، هەردووك بانگی خوایان کرد و وتیان، ئەگەر منداڵێكمان پێبدەیت راستكردار و شیاو، بێ گومان بۆ هەمیشە سپاست دەكەین. کاتێك خوا منداڵێكی راست و ئەندام رێكی پێ بەخشین، بۆ خوا لەوەی بەوانی بەخشیبوو، شەریكیان دروست کرد. پاك و لەپێشترە یەزدان لەو شەریكانەی ئەوان بە تاوان و بووختان دروستی دەكەن ((اعراف/١٨٩/٧——١٩٠)).

دەڵێم: هەمان خوای گەورە، منداڵەكان لەسەرەتاوە دەمرێنێت بەڵام عەبدحارسی بۆتاقی کردن و روانین بەزیندوویی هێشتەوە هەرچەندە ئەو هەموو شتێك بێ تاقی کردنەوە دەزانێت و ئەمە، زانستێكە پاداشت و سزا نایگرێتەوە. یەكەم ئەوەی کوژراو و بكوژ لەپێشتی ئادەم خۆی بوون . ئەم حەدیسە زاناكان لەعەلی کوری ئەبی تالبی دەگێرنەوە کەئادەم لە پرسەی کەرەكەی ئەم دێرانەی وتووە:

تغيرت البلاد و من عليها فوجة الارض مغبر قبيح

تغير كل ذي لون و طعم و قل بشاشة الوجة المليح

واتاكەی: سەرزەوینەكان لەگەڵ ئەو کەسانەی لەسەری دەژین، گۆراون. روخساری زەوی قێزەون و تۆزاویە. هەر خاوەن رەنگ و تامێك گۆرانی بەسەرداهات وكراوەیی روخساری جوان کەمبوویەوە.

هۆنراوەی دیكەیش هەیە لەكیومەرسەوە ئامۆژەی پێدراوە یا کیومەرس گۆرانكاری بەسەردا هێناوە. زۆرینەی زاناكای ئێران دەڵێن کیومەرس هەمان ئادەمە. ئەمانە لەمبارەوە بەڵگەی زۆریان خستۆتە رو کەئامازدەان پێی دەخایەنێت چوونكە خواستی ئێمە ئامازەدان بە پاشاكان و رۆژگارەكانیان بوو نەجیاوازی لەبارەی پێشینیان و پاشایەتی نەژادی، و ئەم کتێبەمان بۆ خواستەكەی خۆمان نوسیوە.

زاناكانی ئێرانی لەوەی دەڵێن لەگەڵ زاناكانیتر— جیاواز لەئێران—بەهەڵەدا چوون

کە گومان دەکەن کیومەرس هەمان ئادەم نییە. ئەوان لەگەڵ زاناکانی ئێرانی لەسەر ناوەکەی کۆکن بەڵام لەبارەی وەسف کردنی ئەو ناسازگارن و دەڵێن: کیومەرس کەنێرانییەکان گومان دەکەن هەمان ئادەمە، حسام کوڕی یوسف کوڕی نوحە. ئەو تەمەن درێژ و سەروەرێکی رێزدار بووە و لەکێوەی ((دۆنباوەند) لەسیلسیلە کێوەکانی تەبەرستان دابەزیوە و لەوێ پاشایەتی کردووە. شانسی خۆی و منداڵەکەی بەرز بۆتەوە بەشێوەیەك بۆ ماوەیەك پاشایەتی بابلیان کردووە و بۆ ماوەیەکی کەم فەرمانڕەوای هەموو سەر زەوی بوون.

کیومەرس شاری زۆری دروست کرد و چەندین قەڵای بنیات نا و ساز و بەرگی شەڕی تەیار و ئەسپی زۆری پەروەردە کرد. ناوی خۆی نا ئادەم و وتی: هەر کەس جیاواز لەم ناوە بانگم بکات دەیکوژم. ئەو سی ژنی وەك هاوسەر هەڵبژارد و منالی زۆری بۆ هاتە دنیا. ((ماری )) کورەکەی و ((ماریانە))کچەکەی لەکۆتایی ژیانی لەدایك بوون. ئەوانی زۆر خۆش دەویست و پێش هەموو منالەکانیتری خستن و پاشاکان لەرەچەڵەکەی ئەم دووانەن.

ئەبو جەعفەری تەبەری دەڵێت: بۆیە داستانەکانی کیومەرسم لێرەدا ئاماژە پێدا تا بزانرێت ئەو باوکی پارسیەکانە و لەمبارەوە لەنێوان زاناکان هیچ دژایەتیەك نییە. دژایەتی لێرەدایە: ئایا ئەو ئادەم و باوکی هەموو مرۆڤەکانە یانە؟ ئەم بابەتە بەو شێوەیە ئاماژەمان پێدا. پاشایەتی ئەو و منالەکانی بەردەوام پایەدار و لەپانتاییەکی پەیوەست لەرۆژهەڵات زەمین جێگیر و سەقامگیر، تا ئەوەی لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان، یەزدگێرد کوڕی شەهریار لەمەرو کوژرا. مێژوو لەسەر بنەمای ناوی پاشاکانی ئەوان، لەخۆگری بەسەرهاتێکی ئاسانترە بۆ لێکۆڵینەوە بەبەراوەرد کردن لەگەڵ ساڵیانی ژیانی پاشاکانیتر لەولآتان و نەتەوەکانیتر لەبەر ئەوەی نەژادیان بۆ ئادەم دەگەڕێتەوە چوونکە ئەوان پاشایەتی بەردەوامیان بووە و فەرمانڕەوایی بۆ منالەکانیان ماوەتەوە بەشێوەیەك یەکەم پاشا بەدوایین پاشا و زیندوویان بە مردوویان پەیوەستە و بۆ کەسانیتر ئەم پایەدارییە نەهاتە ئاراوە.

★★★★&★

ئێستا ئاماژە بەدرێژەی باسەکە دەدەم کەتەمەنی درێژی ئادەمە و ساڵەکانی ژیانی ئەو دەستە لەمناڵەکانی ئەو کە بوونە پاشا و پێغەمبەر. هەروەها داستانی ژیانی کیومەرس باوەگەورێی ئێرانییەکان دەنوسمەوە و ئاماژە بەکارەکانیان دەدەم. ئەم گێڕانەوە لەو زەمەنەوە دەست پێدەکات کەخۆی پاشایەتی گرتەدەست.

ئادەم بەو پاشایەتیەی خوای گەورە لەسەرانسەری زەوی پێی بەخشیبوو، پێغەمبەرێك بوو لەلایەن خوا بۆ لای مناڵەکانی. خوا بیست و یەك صەحیفەی بۆ نارد. جبرەئیل فێری کرد و و هەمووی بەدەستی خۆی نوسی. ئەبوزەری غەفاری لەپێغەمبەر(د.خ) دەگێرێتەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەرەکان سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەر (د.خ) بوون. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، لەم ناوەدا چەند کەس نێردراو (رەسوڵ) بوون؟ فەرمووی: سێسەد و سیانزە کەس، دەستەیەکیان گەورە بوون یانی زۆر پاك . وتم: یەکەمیان کێ بوو؟ فەرمووی: ئادەم. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئەو پێغەمبەرێکی نێردراوە بوو؟ وتی: بەڵێ، خوا ئەوی بەدەستی خۆی ئافراند و لەگیانی خۆی کردە بەری و دواتر ئەوی کردە پیاوێکی بەهێز.

لەو سەحیفانەی بۆ ئەو هاتە خوار، حەرام بوونی مردار و خوێن و گۆشتی بەراز بوو. پیتەکانی ئەلف بێ بۆ ئەو هاتە خوار و کتێبەکەی ئەو بیست و یەك بەرگ بوو.

## لەدایك بوونی شیس

له روداوەکانی رۆژگاری ئادەم لەدایك بوونی شیسە کە لەسەد و بیست ساڵی ئادەم و پێنج ساڵ دوای کوژرانی هابیل رویدا. دەڵێن: شیس بێ هاوتا و تەنیا لەدایك بوو. مانای شیس ((هبه الله)) بەخشینی خوایە. ئەمە بەو مانایە ئەو جێگرەوەی هابیل و جێگری ئادەم بوو. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو هاوتایەکی بوو لەگەڵ ئەودا چاوی بەدنیا هەڵهێنا. کاتێك سەردەمی مەرگی ئادەم نزیك بوویەوە کارەکانی خۆی بە شیس سپارد و کاتژمێرەکانی شەو و رۆژی فێر کرد. فێری کرد لەهەر کاتژمێرێکیدا چۆن خوا بپەرەستێت. شیسی لەرودانی تۆفان لەرۆژگاری نوحی داهاتوو ئاگادار کردەوە. دوای ئادەم سەروەری بەشسی گەشت. خوا پێنج صەحیفەی بۆ نارد. هەموو مرۆڤەکان تا ئێستا منداڵەکانی ئەون. ئێرانییەکان دەڵێن ئادەم هەمان کیومەرسە. دەڵێن: بۆ کیومەرس میشانی خوشکی میشی لەدایك بوو. میشی لەگەڵ خوشکەکەی خۆی میشان پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و سیامەك و سیامی لەوان چاویان بەدنیا هەڵهێنا. بۆ سیامەکی کوڕی میشان کوڕی کیومەرس ئەمانە لەدایك بوون: ئەفروال، دەقس، بوورەسب، ئەجرەب و ئەوراش کەدایکی هەموویان سیامی کچی میشییە. ئەو خوشکی باوکیانە. دەڵێن سەرانسەری زەوی حەوت هەرێم بووە. سەرزەوینی بابل و سەرزەمینەکانی پەیوەست بەو سەرزەمینە کەخەڵك لەوشکی و دەریاوە روی تێدەکەن، هەرێمێکی تاقانەیە و پاشماوەکانیان منداڵەکانی ئەفروال کوڕی سیامەك و زادەکانی ئەون.

بۆ ئەفروال کوڕی سیامەك لەئەفری کچی سیامەك، ئەوشهەنج (هوشەنگ) پاشای پیشداد لەدایك بوو. ئەو کەسەیە بووە جێگری باوەگەورێی خۆی کیومەرس لەپاشایەتی. یەکەم کەس بوو پاشایەتی حەوت هەرێمەکەی بەدەست هێنا و ئێمە بەسەرهاتەکانی ژیانی ئەو دەگێرینەوە. دەستەیەك لەئێرانییەکان گومان دەکەن ئەم هوشەنگە کوری خودی ئادەم و حەوا و لە پشتی ئەوە.

کوڕی کلبی گومانی بردوە یەکەم کەس بەپاشایەتی سەر زەوی گەشتبێت، نوشهەنق

کوڕی عابر کوڕی شالخ کوڕی ئەزفەخشد کوڕی سام کوڕی نوحە. ئێرانییەکان گومانیان دەکرد ئەو دوسەد ساڵ دوای ئادەم بووە لەکاتێکدا ئەو دوسەد ساڵ دوای نوح ژیاوە و ئێرانییەکان روداوەکانی پێش نوحیان نەزانیوە.

ئەوەی هوشام کوڕی کەلبی ئاماژەی پێداوە بنەمایەکی راستی نییە چوونکە نوشهەنج لەناو ئێرانییەکان ناودارە و هەر نەتەوەیەك زیاتر لەکەسانیتر لەرەچەڵەك و مێژووی خۆی شارەزا و ئاگادارە. هەندێ رەچەڵەك ناسی ئێرانی گومانیان کردووە ئوشهەنج ((هوشەنگ)) هەمان مەهلاییلە و باوکی ئەفراول هەمان قینانە و سیامەك هەمان ئەونوش باوکی قینانە و میشی هەمان شیس باوکی ئەنوش و کیومەرس هەمان ئادەمە. ئەگەر ئەوەی ئەمان دەیڵێن راست بێت گومانی تێدا نییە هوشەنگ لەسەردەمی ئادەم پیاوێك بووە. بەم بەڵگەیە لەسەر بنەمای نوسینە کۆنەکانی کتێبەکانی رابردووان، لەدایك بوونی دایکی دینە کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەم لە کاتێکدا بوو لەژیان ئادەم سێسەد و نەوەد و پێنج ساڵ تێپەریوە و ئەو لەکاتی مردن شەشسەد و شەست و پێنج ساڵی تەمەن بووە. ئەمە لەسەر ئەو بنەمایە کەتەمەنی ئادەم هەزار ساڵ لەبەرچاو بگرین. ئێرانییەکان گومانیان بردووە پاشایەتی هوشەنگ چل ساڵ درێژەی کێشاوە. ئەگەر لەسەر ئەو بنەمایە بێت کەرەچەڵەك ناسانی رابردوو ئاماژەیان پێداوە، پاشایەتی ئەو دوسەد ساڵ دوای مردنی ئادەم بووە.

## مردنی ئادەم

دەڵێن: ئادەم یانزە رۆژ نەخۆش بوو، و لەم کاتەدا شیس ی کردە جێگری خۆی و فەرمانی پێدا زانستی خۆی لەقابیل و منالەکانی بشارێتەوە چوونکە ئەو بوو لەبەر رژدی بردن هابیلی کوشت لەبەر ئەوەی خوا زانستی بەهابیل بەخشیبوو. شیس و منالەکانی زانستی خۆیان شاردەوە و قابیل و منالەکانی زانسیتان نەبوو تا کەڵکی لێوەربگرن. باوکی هورەیرە لە پێغەمبەر (د.خ) حەدیسێك دەگێڕێتەوە کە

فەرموویەتی: خوا بە ئادەمی فەرموو: برۆ لای ئەو فریشتانە و بڵێ ((سڵاوی خواتان لێبێت)). ئادەم رۆشتە لایان و سڵاوی نارد و فریشتەکان لەوەڵامدا وتیان: ((سڵاو و خۆشەویستی خوا لەتۆ بێت.))

ئەوسا ئادەم بۆلای خوا گەرایەوە و خوا پێی فەرموو: ئەم سڵاوە بۆتۆیە و سڵاوی منداڵەکانی تۆ لەناویدایە. ئەوسا خوا دودەستی خۆی بەست و لێی نزیك کردەوە و فەرمووی: هەڵگرە و هەڵبژێرە. ئادەم وتی: دەستی راستی خوای خۆم خۆش دەوێت و هەر دو دەستی راستە. خوا دەستی راستی خۆی بۆئادەم کردەوە. لەناکاو بینی وێنەی خۆی و هەموو منداڵەکانی تارۆژی کۆتایی تێدایە و تەمەنی ژیانی هەرکام نوسراوە و ئادەم خۆی هەزارساڵی پێبڕاوە. هەروەها ئەو خەڵکانەی بینی روناکی لەروخساریان دەبارێت.

ئادەم وتی: خوایە ئەمانە کێن روناکی لەروخساریان دەبارێت. فەرمووی: پێغەمبەران و نێردراوانی منن. ئەوان بۆ لای بەندەکانم دەنێرم. لەناویاندا پیاوێك دەبینرا روخساری لەهەموویان روناکتر دەهاتە بەرچاو بەڵام تەنیا چل ساڵ ژیانیان بۆ دیاریکردبوو. ئادەم – دوای ئەوەی زانی داوودی پێغەمبەرە- وتی: خوایە، ئەم پیاوە روناکترینی هەموویانە بەڵام بۆ ئەو زیاتر لەچل ساڵیان نەنوسیوە. فەرمووی: ژیانی هەر ئەوەیە کەدیاریم کردووە. ئادەم وتی: خوایە لەژیانی من شەست ساڵ کەمبکەرەوە و بیخە سەر ژیانی داوود. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوای ئەوەی ئادەم بۆ زەوی دابەزێنرا و کاتێك فریشتەی مەرگ بۆ سەندنی گیانی هات، ئادەم وتی: ئەی فریشتەی مەرگ تۆ پەلەت کرد چوونکە هێشتا شەست ساڵ لەتەمەنی من ماوەتەوە. فریشتەی مەرگ پێی وت: هیچ نەماوەتەوە چوونکە تۆ داوات لەخوا کرد شەست ساڵ لەتەمەنی تۆ بخاتە سەر تەمەنی داوود. ئادەم وتی: ئەم کارەم نەکردووە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئادەم بیری چوو و منداڵەکانی لەبیریان کرد، ئەو حاشای کرد و ئەمان حاشایان کرد. لەم کاتەدا بوو خوا بناغەی نوسین و شایەت گرتنی دانا.

لەعەبدوالله کوڕی عەباس دەگێرنەوە: کاتێك ئایەی وام دابەزی (بقرە/ ٢٨٢/٢—٢٨٣

: لەکاتی ئاڵ و گۆڕ و دانی قەرز و وام، بنووسن و شایەت و دەستەبەر وەربگرن))، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: یەکەم کەس حاشای کرد ئادەم بوو و ئەو سێ جار ئەم کارەی کرد: کاتێك خوا ئەوەی ئافراند، دەستی بەپشتیدا هێنا و هەموو ئەوانەی لەو بوون تا ڕۆژی کۆتایی هێنایە دەر و نیشانی دا. ئادەم لەناو ئەوان یەکێکی لەهەمووان بە نورانیتر بینی. وتی: خواوەندا ئەمە کێیە؟ فەرمووی: داوودی کورتە. وتی: تەمەنی چەندە بۆ نوسراوە. فەرمووی: چل ساڵ. ئادەم وتی: تەمەنی بۆ زیاد بکە. خوا فەرمووی: ئەگەری نییە جگە لەوەی تۆ خۆت زیادی بکەیت. تەمەنی ئادەم هەزار ساڵ بوو. بەداوود شەست ساڵی بەخشی. خوا بۆ ئەم کارە نوسراوێکی ئامادە کرد و فریشتەکانی کردە شایەت. کاتێك سەردەمی مەرگی ئادەم گەشت ، فریشتەکان هاتن تا گیانی بگرن. ئادەم وتی: لەژیانی من شەست ساڵ ماوەتەوە. فریشتەکان وتیان: ئەو شەست ساڵەت بە کورەکەت داود بەخشی. ئادەم وتی: نەمبەخشیوە. لەم کاتەدا خوا نوسراوەکەی خۆی بۆ لای ئادەم نارد و فریشتەکان هاتنە خوار و شایەتیان دا. بەڵێ، خوا هەم هەزار ساڵ ژیانی بە ئادەم بەخشی و هەم تەمەنی داوودی بۆ سەد ساڵ درێژ کرد.

هاوشێوەی ئەم گێرانەوەیە کەسانیتریش ئاماژەیان پێداوە وەك سەعید کوڕی جوبەیر. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: تەمەنی ئادەم نۆسەد وسی و شەش ساڵ بوو. ئەو حەدیسانەی لەپێغەمبەری خوا و زاناکانیتر ئاماژەیان پێدراوە ئەوانەن ئاماژەمان پێدا و پێغەمبەر(د.خ) زاناترینی کەسەکانە. بەپێی گێرانەوەی باوکی هەرییە کەتیایدا ئادەم شەست ساڵ ژیانی خۆی بەداوود بەخشیبوو، جیاوازییەکی زۆر لەنێوان دوو حەدیسەکەدا نییە. ئەگەری هەیە خوا لەتەوراتدا تەمەنی ئەوی جیاواز لەو چل ساڵەی بە داوودی بەخشیوە، نوسیبێت. کوڕی ئیسحاق لە یەحیا کوڕی عیباد لەباوکی دەگێرێتەوە: کاتێك ئادەم مرد، خوا کفن و دفنی ئەوی لەبەهەشتەوە نارد و ئەوسا فریشتەکان ئارامگای ئەویان دیاری کرد و ئەویان بە خاك سپارد و دایانشارد. لەئەبی کوڕی کەعب لەپێغەمبەر(د.خ) حەدیسێك هاتووە: کاتێك کاتی مردنی ئادەم هات، خوا کفن و دفنی ئەوی لەبەهەشتەوە نارد و کاتێك

حەوا فریشتەکانی بینی، هەنگاوی بردە پێش تا پێش ئەوان بڕواتە سەر جەستەی ئادەم. ئادەم وتی: ئەی ژن، من لەگەڵ نێردراوانی خواوەندەکەم بەتەنیا جێبێڵە چوونکە ئەوەی بینیم تەنیا لەتۆ نەمبینی و ئەو بەڵایانەی بەسەر مندا هات تەنیا بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی تۆ بوو. کاتێك مرد، فریشتەکان ئەویان بە سەدەر و ئاو شۆرد و لەناو پارچەیەکدا کفنیان کرد و دواتر گۆڕی ئەویان هەڵکەنی و ئەویان لەوێدا بەخاك سپارد و وتیان: سەرئەنجام و چۆنییەتی کاری ئادەم زادەکان لەکاتی مردن بەم شێوە دەبێت. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك ئادەم مرد. شیس بەجبرائیلی وت: نوێژی لەسەر بخوێنە. جبرەئیل وتی: تۆ هەنگاو بنێرە پێش و لەسەر باوکت نوێژ بخوێنە. شیس سی جارتەکبیری وت. پێنج جار بۆ نوێژ، بیست و پێنج جار بۆ لەپێشی ئادەم. دەڵێن: ئادەم لەکێوی ئەبو قبیس بەخاك سپێردرا کەپێیان دەوت ئەشکەوتی گەورەکان. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك نوح لەکەشتی هاتەدەر، ئادەمی لەبیت المقدس بەخاك سپارد. مەرگی ئەو بەو شێوەی ئاماژەی پێدرا، لەرۆژی هەینیدا روویدا. دەڵێن: حەوا یەك ساڵ دوای ئادەم ژیا و دواتر مرد و ئەویان لای هاوسەرەکەی لەو ئەشکەوتەی ئاماژەی پێدرا، بەخاك سپارد. لەوێدا مانەوە تا کاتی تۆفانی نوح. نوح، ئەو دوانەی هێنایەدەر و لە تابوتیکدا داینان و بۆ ناو کەشتییەکەی بردن. کاتێك زەوی لەناو خاڵی بوو، نوح ئەوانیی گەڕاندەوە بۆ شوێنی یەکەم. دەڵێت. حەوا ڕستی، چنی، هەویری دروست کرد، نانی کرد و هەموو ئەوکارانەی کرد کەژنان دەیکەن.

ئێستا کۆتایی بەداستانی ئادەم و دوژمنەکەی ئیبلیس و ئاماژەدان بە ژیانی ئەوان دەهێنین. وتمان خوا چ بەڵایەکی بەسەر ئیبلیسدا هێنا چوونکە لەخۆبایی بوون و نافەرمانی کردە پیشە و خواوەند سزایدا و دووریخستەوە و تا رۆژی کۆتایی مۆڵەتی پێدا. هەروەها ئاماژەمان بەداستانی ئادەم دا کەسزا درا و دواتر خوا خۆشەویستی خۆی پێبەخشیوە چوونکە لەگوناحەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و داوای لێخۆشبوونی کرد. هەنووکە بەخواستی خوا ئاماژە بەداستانی ژیانی دوو منداڵەکەی ئادەم هابیل و قابیل و شیس و منداڵەکانی ئەوان دەدەین.

## بەسەرهاتی شیس علیه السلام

ئێمە بەشێك لەبەسەرهاتی ژیانی شیسمان باس كرد كەجێگری باوكی لەسەر پاشماوەكانی دوای مەرگی ئادەم بوو و خوا چەندین صەحیفەی بۆ ناردەخوار. دەڵێن: بەردەوام لەمەككە بوو، حەج و عەمرەی دەكرد تا مرد. هەموو ئەو سەحیفانەی بۆ خۆی و باوكی هاتبووە خوار، كۆكردەوە و بەكاری بەست. هەروەها كەعبەی بە گڵ و بەرد دروست كرد.

زاناكانی رابردووی ئێمە دەڵێن: گومەزێك خوا لەناو ماڵەكە بۆ ئادەم بەرزی كردەوە، تا كاتی تۆفانەكەی نوح لەسەر پێ بوو و كاتێك خوا تۆفانی نارد، گومەزەكەی بۆ ئاسمان بەرز كردەوە. دەڵێن: كاتێك شیس نەخۆش كەوت، وەسیەتی بۆ ئەنوشی كوری كرد و كردی بەجێگری خۆی و مرد و ئەویان لای باوكی لەئەشكەوتی ئەبوقەبیس بەخاك سپارد. رۆژی لەدایك بوونی ٢٣٥ ساڵ دوای لەدایك بوونی ئادەم بوو. ئاماژەیان بەبابەتی دیكەیش داوە. لەكاتی مردن ٩١٢ ساڵ تەمەنی بوو.

### (( مناڵەكانی شیس ))

دوای شیس كورەكەی ئەنوش كوڕی شیس فەرمانرەوایی گرتە دەست و لەجێگەی باوكی دانیشت و گۆڕانكاری لەكارەكانی ئەودا دروست نەكرد. تەمەنی ساڵەكانی ژیانی ئەنوش ٧٠٥ ساڵ بوو. ئەمە وتاری شوێنكەوتەكانی تەوراتە.

عەبدوالله كوڕی عەباس دەڵێت: بۆ شیس، ئەنوش لەدایك بوو و هاورێ لەگەڵ ئەو چەندین مناڵی دیكە چاویان بەدنیا هەڵهێنا. شیس ئەوی كردە جێگری خۆی. بۆ ئەنوش، قینان لەخوشكەكەی نعمە كچی شیس لەنەوەد ساڵی ئەنوش چاوی بەدنیا هەڵهێنا. بۆ ئەنوش جیاواز لەو چەندین مناڵی دیكە هاتنە دنیا و ئەوی كردە جێگری خۆی. بۆ قنیان، مهلاییلی لەدایك بوو و هاورێ لەگەڵ ئەو چەندین مناڵی

دیکە هاتنە دنیا و ئەوی کردە جێگری خۆی. مهلاییل، یەردی هێنایە دنیا کەهەمان یاردە و چەندین منالی دیکە چاویان بەدنیا پشکوت و ئەوی کردە جێگری خۆی. یەرد خنوخی بوو کەهەمان ئیدریسی پێغەمبەرە. چەندین منالی دیکەیش لەو چاویان بەدنیا هەڵهێنا و ئەوی کردە جێگری خۆی. بۆ خنوخ، متوەسلخی هاتە دنیا لەگەڵ چەندین منالی دیکە و ئەوی کردە جێگری خۆی.

تەورات دەگێڕێتەوە کەمهلاییل کاتێك لەدایك بوو ئادەم ٣٩٥ ساڵە و قنیان ٧٠ ساڵە بوو. یەرد بۆ مهلاییل کاتێك هاتە دنیا لەتەمەنی ئادەم ٤٦٠ ساڵ تێپەریبوو. ئەو لەسەر شێوەی باوکی خۆی دەرۆشت جگە لەوەی لەسەردەمی ئەو روداوەکان دەستیان پێکرد.

## ڕووداوەکان لەدەسپێکی پاشایەتی شیس تا پاشایەتی یەرد

دەڵێن کاتێك قابیل هابیل کوشت و بۆ یەمەن رایکرد، ئیبلیس ڕۆشتە لای و پێی وت: لەبەر ئەوە ئاگر قوربانییەکەی هابیلی قووتدا چوونکە ئاگری دەپەرەستی. تۆیش ئاگرێك بۆ خۆت و منداڵەکانی خۆت داگیرسێنە. قابیل ئاتەشگایەکی دروست کرد. یەکەم کەس بوو ئاگری پێکرد و ئاگری پەرەست.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: قین کە هەمان قابیلە، لەگەڵ خوشکەکەی خۆی ئاشوت کچی ئادەم پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. ئەم ژنە کوڕ و کچێکی بۆ هێنایە دنیا: خنوخ کوڕی قین و عەزەب کوڕی قین. عەزەب شوی کرد بەبراکەی خۆی خنوخ و ئەم ژن و مێردە سێ کوڕ و کچێکیان بۆ هاتە دنیا: غیرەد، مەحویل، ئانوشیل و مولیس کچی خنوخ. ئانوشیل کوڕی خنوخ خوشکەکەی خۆی مولیس کوڕی خنوخی هێنا و لەم دوانە کوڕێك بەناوی لامەك چاوی بەدنیا هەڵهێنا. لامەك دوو ژنی بەهاوسەری هەڵبژارد کەناوی یەکیان عەدی و یەکیان صەلی بوو. عەدی سێ کوڕی هێنایە دنیا: پولس کوڕی لامەك، توبلین و توبلقین. تولس کوڕی لامەك یەکەم کەس بوو خێوەتی گەورەی هەڵدا و سامانی کۆکردەوە. توبلین یەکەم کەس بوو تار و چەنگی ژەنی. توبلقین یەکەم کەس بوو مس و ئاسنی بەکار برد و کەرەستەی لێدروست کرد. منداڵەکانی ئەوان فەرمانڕەوا زاڵم و ستەمکارەکان بوون و ڕوخساریان جوان بوو. دەڵێت: دوای ئەوەی منداڵەکانی قین ڕووخان وجگە لەکەمێکیان نەمایەوە و منداڵەکانی ئادەم هەموویان ڕەچەڵەکی خۆیان لەبیرکرد و بنەماڵەکەیان هەڵوەشا جگە لەوانەی لەپشتی شیس بوون. لەبەر ئەمە هەموو منداڵەکانی ئادەم لەپشتی ئەون و ڕەچەڵەکی ئەمڕۆی خەڵك بۆ ئەو دەگەڕێتەوە نەمنداڵەکانیتری ئادەم. کوڕی ئیسحاق لەبەسەرهاتی قابیل و منداڵەکانی جگە لەوەی ئاماژەمان پێدا، ئاماژەی بەهیچیتر نەداوە.

شوێنکەوتوانیتری تەورات دەڵێن: یەکەم کەسان گەمەکانیان دروست کرد منداڵەکانی

قابیل بوون. لەناو ئەوان پیاوێك دەبینرا كەسۆبال كوڕی قابیلیان پێدەوت و لەرۆژگاری مەهلاییل كوڕی قنیان كەرەستەكانی ئاواز خوێندنی دروست كرد: نەی، تەمبوور، دەهۆڵ، عود و ساز. منداڵەكانی قابیل لەناو گەمەكردن رۆچوون و بەسەرهاتی ژیانی ئەوان بەكێونشینەكان لەرەچەڵەكی شیس گەشت. سەد پیاو لەناو ئەوان مەبەستی رۆشتنە ناو منداڵەكانی قابیلیان كرد و پێشنیارەكانی باوكی خۆیان خستە ژێرپێ. ئەم هەواڵە بەگوێی یارد گەشت و ئەو، ئەوانی ئامۆژگاری كرد و داوای لێكردن لەرۆشتن پەشیمان ببنەوە بەڵام ئەوان ئامۆژگاریەكانیان لەگوێ نەگرت. رۆشتنە لای منداڵەكانی قابیل و لەوەی بینیان شادمان بوون. كاتێك ویستیان بگەرێنەوە، لەم كارە پەشیمان بوونەوە و ئەمە دوای ئەو داواكاریە بوو پێشتر باوكیان ئەوانی لێ ئاگادار كردبوویەوە. لەبەر ئەوەی مانەوەی ئەوان زۆری خایاند، كێونشینەكان كەدڵیان لێوانلێو بوو لەچەوتی و هەڵە، زانیان ئەوان لەبەر خۆشگوزەرانی ماونەتەوە. ئەوانیش یەك یەك لەكێو هاتنە خوار و گەمەكانیان بینی و شادمانی خۆیانیان نیشاندا. ئەوان روبەروی ئەو ژنانە بوونەوە كەباوەشیان كردبوویەوە بەرویاندا. ژنەكان لەرەچەڵەكی قابیل بوون. پیاوان لەگەڵ ئەم ژنانەدا تێكەڵاو و لەنافەرمانی و گوناح كردن دا نوقم بوون و قەبێحی و مەیخواردنەوە لەناو ئەواندا بڵاو بوویەوە. ئەمە گێڕانەوەیەكە لەراستییەوە دوور نییە چوونكە دەستەیەك لەزانا موسوڵمانە كۆنەكان ئاماژەیان بەم گێڕانەوەیە داوە. هەرچەندە باسیان نەكردووە ئەم كارانە لەسەردەمی پاشایەتی كام كەسەدا ئەنجامی گرتووە. دەڵێن: ئەم كارانە لەنێوان ئادەم و نوحدا رویانداوە. لەوانە عەبدوالله كوڕی عەباس و هاوتاكانی . هاوشێوەی ئەم گێڕانەوەیە عۆتەیبە لەباوكی ئاماژەی پێداوە جیاواز لەوەی لەنێوان ئەم دو گێرانەوەدا جیاوازی هەیە. و خوا زاناترە.

رەچەڵەك ناسانی ئێرانی لەم بوارەدا ئاماژەیان بەو بابەتەداوە كەلەبارەی مەهلاییل كوڕی قنیان دەڵێن: ئەو هوشەنگە كە فەرمانڕەوایەتی حەوت هەرێمەكەی دەكرد.

هوشام كوڕی كلبی دەڵێت: ئەو یەكەم كەس بوو بینای دروست كرد و فەرمانی بەخەڵكانی رۆژگاری خۆیدا نوێژگە دروست بكەن. دو شاری دروست كرد و ئەم

دوشارە یەکەم شارەکان بوون لەسەر زەوی دروست کران. بابل لەعێراق و شووش لەخوزستان. رۆژگاری پاشایەتی ئەو لەدوای چل ساڵ کۆتایی پێهات. کەسانێ دەڵێن: یەکەم کەس بوو ئاسنی لەزەوی دەرهێنا و کەرەستەکانی لێ دروست کرد و ئاوی بۆ شوێنە بەسوودەکان برد و خەڵکی بۆ جوتیاری و کرێکاری ناچار کرد و فەرمانیدا ئاژەڵە کێوی و دەشتیەکان بکوژن و لەگۆشتی ئەوان خواردن دروست بکەن. شاری رەی دروست کرد کەدەڵێن دوای شاری کیومەرس لەدۆنباوەند یەکەم شار بوو. دەڵێن: یەکەم کەس بوو بناغەی ئایین و ئەندازەکانی داراشت و لەبەر ئەمە پێی دەڵێن: پیش داد بەمانای یەکەم دادپەروەر. یەکەم کەس بوو لەکاری کەنیزەکان کەڵکی وەرگرت و دارەکانی بڕی و لەبینا دروست کردن کەڵکی لێوەرگرتن. دەڵێن: بەدنیادا گەڕا و لەهیند دابەزی و تاجی لەسەر سەردانا. دەڵێن: ئیبلیس و سوپاکەی تێکشکاند و ئەوانی لەتێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵکان دوور کردەوە. دێوە یاخییەکانی کوشت و لەبەر ئەمە دێوەکان لەترسی ئەو پەنایان بۆ کوێستان و کێوەکان برد بەلاّم کاتێك مرد، گەڕانەوە. دەڵێن: ئەو بوو خراپەکارانی بە دێو ناودەبرد و ئەوانی ناچار بەکارکردن کرد و هەموو هەرێمەکانی خستە ژێر فەرمانی خۆی. لەنێوان لەدایك بوونی هوشەنگ و مردنی کیومەرس( ٢٢٣) ساڵ بوو.

## بیرکردنەوەی یارد (( یەرد ))

بەم شێوەیە ئامازەیان بەناوی ئەو داوە: یارد کوڕی مەهلاییل. دایکی پووری کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی ڤین کوڕی ئادەم بوو. ٤٦٠ ساڵ دوای لەدایك بوونی ئادەم چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەسەردەمی ئەو بتەکان دروست کران و زۆر کەس لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە. بەوتەی کوڕی ئیسحاق، یارد لەسەد و بیست ساڵی لەگەڵ برەکتا، کچی درەمسیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی ڤین کوڕی ئادەم، پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست.

بەرەکتا خنوخی بۆهێنایە دنیا کەهەمان ئیدریسی پێغەمبەرە. ئەو یەکەم کەس بوو پێگەی پێغەمبەری پێ بەخشرا و یەکەم کەس بوو بەپێنوس خەتی نوسی. یەکەم کەس بوو زانستی ئەستێرەناسی و ژماردن فێربوو و فرمزانەکانی یۆنان ئەویان بە(هرمسی فرەزان) ناو بردووە. پێگەی لای ئەوان زۆر گەورە بوو. یارد دوای لەدایك بوونی ئیدریس ٨٠٠ ساڵ ژیا و چەندین کچ و کوڕی هێنایە دنیا. ساڵەکانی ژیانی ئەو ٩٦٢ ساڵ درێژەی کێشا. دەڵێن: سی صەحیفە بۆ ئیدریس هاتە خوار. یەکەم کەس بوو لەرێگەی خوادا شەڕی دەکرد و قوماشی بڕی و جلّ و بەرگی دووری. یەکەم کەس بوو دەستەیەکی لەمناڵانی قابیلی بەدیلی گرت و ئەوانی کردە کۆیلە. جێگری باوکی بوو و ئەو شتانەی لەباوکی بۆ مایەوە کەباوەگەورێکانی وەك وەسیەت بۆ ئەوانیان بەجێهێشتبوو. ئادەم کاتێك مرد کەلەژیانی ئیدریس ٣٠٨ ساڵ تێدەپەری. ئیدریس خەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە و ئامۆژگاری کردن و بەفەرمانبردن لەخوای گەورە و خۆ دوور خستنەوە لە دێو و تێکەڵ نەبوون لەگەڵ منداڵەکانی قابیل هانیدەدان بەلاّم ئەوان قسە و ئامۆژگارییەکانی ئەمیان نەبیست. دەڵێت: لەتەوراتدا هاتووە خوا ئیدریسی لە ٣٦٥ساڵیدا بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و باوکی دوای ئەو ٤٣٥ ساڵ ژیا کەهەموو ساڵەکانی تەمەنی لە٩٦٢ کۆتایی پێهات. پێغەمبەر(د.خ) فەرموی: ئەی باوکی زەڕ، لەپێغەمبەران چواریان سریانی بوون: ئادەم ، شیس، نوح و خنوخ. یەکەم کەس بوو بەپێنوس شتی نوسی و خوا سی صەحیفەی بۆ ناردەخوار. دەڵێن: خوا ئەوی وەك پێغەمبەری هەموو خەڵکی سەرزەوی لەرۆژگاری خۆیدا ڕەوانە کرد و هەموو زانستی رابردووانی فێرکرد و سی صەحیفەی بۆ ناردەخوار. دەستەیەك دەڵێن: بیوراسب لەرۆژگاری ئیدریس بەپاشایەتی گەشت. بەشێك لەوتارەکانی ئادەم بەو گەشت کە کردی بەبنەمای جادوگەری و کەڵکی لێوەرگرتن.

## پاشایەتی تەهمورس

ئێرانییەکان دەڵێن: دوای مەرگی نوشهەنج (هوشەنگ) تەهمورس کوڕی ویونجەهان (یانی باشترین خەڵکی سەر زەوی) دەرکەوت و ئەو کوری حۆبایداد کوڕی هوشەنگە. لەبارەی رەچەڵەکەی ئەو گێرانەوەیەکیتریش هەیە. ئێرانییەکان دەڵێن: ئەو فەرمانرەوایەتی حەوت هەرێمەکەی کرد و تاجی لەسەر سەری خۆیدانا و لەفەرمانرەوایی بەسەر ژێردەستەکان دادپەروەری کردە پیشە و ئەوانی خۆشدەویست. بناغەی شاری شاپوری لەفارس دارِشت و بەشارەکاندا گەرا و لەفارسدا نیشتەجێ بوو. ئیبلیسی گرت و سواری بوو و بەهەمان شێوە بە سواری لەم سەر تا ئەو سەری زەوی رۆشت. ئیبلیس و لەشکرەکەی ترساند بەشێوەیەك بلاوەیان لێکرد. یەکەم کەس بوو موو و پەشمی بۆ دروست کردنی فەرش و جل و بەرگ بەکاربرد. هەروەها یەکەم کەس بوو رازاندنەوەی پاشاکانی هەڵبژارد و ئەسب و ئێستر و کەری لەگەڵ خۆیدا بۆناو لەشکر برد. فەرمانیدا بۆ پاسەوانی کردنی ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات، سەگ بەکار ببەن و لەباڵندە راوچییەکان بۆ راوکردن کەڵك وەربگرن. ئەو بوو نوسینی بەزمانی پارسی دەسپێکرد.

بیوراسب لەیەکەم ساڵەکانی پاشایەتی ئەو دەرکەوت و خەڵکی بۆ ئایینی (صائبان) بانگێشت کرد.

ئەبوجەعفەری تەبەرەی و زاناکانیتر بەم شێوە ئاماژەیان پێداوە کە ئەو سوار ئیبلیس بوو و سوار لەسەر ئەو بەجیهاندا گەرا. راستی و ناراستی ئەم قسە لەملی ئەواندایە و ئێمە تەنیا ئەو بابەتە دەگێرینەوە ئەوان باسیان کردووە. کوڕی کەلبی دەڵێت: یەکەم پاشای سەر زەوی لەبابل دەرکەوت و ناوی تەهمورس بوو. فەرمانبرداری خوا و چل ساڵ فەرمانرەوایی کرد و یەکەم کەس بوو بە زمانی پارسی شتی نوسی. لەرۆژگاری ئەو بتپەرستی دەستی پێکرد. لەرۆژگاری ئەودا بوو خەڵك رۆژویان ناسی و بەرۆژو بوون. بزوێنەر بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کۆمەڵێك خەڵکی هەژار، لەبەر بێ خواردنی و لەروی ناچاری، رۆژەکان دەستیان لەخواردن وخواردنەوە

هەڵگرت و شەوانە خواردنیان دەخوارد. ئەوسا ئەمەیان کردە باوەڕی خۆیان و بەهۆکاری نزیکی لەخوا هەژماریان کرد. دوای ئەوە ئایینەکان ئەم کارەیان کردە ئەرکێکی پێویست.

## بیرکردنەوەی خنوخ کەهەمان ئیدریسە

نوخ کوڕی یەرد لەگەڵ هۆدانە یا نۆزانە کچی باویل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەم پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. هۆدانە بۆ ئەو متوشلەخ کوڕی خنوخی هێنایە دونیا و خنوخ دوای ئەو، سێسەد ساڵ ژیا و دواتر بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە.

خنوخ ئەوی بۆ راپەراندنی کاری منداڵەکانی خۆی و کاری خوا کردە جێگری خۆی و وەسیەتی بۆ ئەو و بنەماڵەکەی کرد و ئەوانی ئاگادار کردەوە کەخوا بەزوترین کات منداڵەکانی قابیل وئەوانەی تێکەڵیان دەبن، ئەشکەنجە دەدات و سزایان دەدات. ئەوانی لە تێکەڵ بوون لەگەڵ قابیلیەکان ئاگادار کردەوە و لەم بارەوە رێنوێنی کردن. یەکەم کەس بوو سوار ئەسب بوو چوونکە لەشەڕدا شێوەی باوکی خۆی بەکار دەبرد.

متوشلەخ لەگەڵ عۆربا کچی عەزازیل کوڕی ئەنوشیل کوڕی خنوخ کوڕی قین کوڕی ئادەم پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و لەم کاتەدا ١٣٧ ساڵ تەمەنی بوو. عۆربا بۆ ئەو لەمەك کوڕی متوشلەخی هێنایە دونیا و ئەو، دوای لەدایك بوونی لەمەك ٧٠٠ ساڵ ژیا. هەمووساڵەکانی تەمەنی ئەو ٩٢٧ ساڵ درێژەی کێشا. ئەو مرد وکوڕەکەی کردە جێگری خۆی. ئامۆژگاری خەڵکەکەی خۆی دەکرد و ئەوانی لەتێکەڵ بوون لەگەڵ قابیلیەکان ئاگادار دەکردەوە بەڵام ئەوان گوێیان لێنەگرت تا ئەوەی هەموویان لەکێو هاتنە خوار و رۆشتنە لای منداڵەکانی قابیل. متوشلەخ منداڵێکیتری بەناوی صابی بوو و صائبیان لەو ناوەکەیان وەرگرتوە.

لەمەك کوڕی متوشلەخ لەگەڵ قینوش کچی براکیل کوڕی مەحویل کوڕی خنوخ کوڕی

ڤین پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و لەم کاتەدا ١٨٧ ساڵ تەمەنی بوو. ئەم ژنە بۆ ئەو نوحی پێغەمبەری هێنایە دونیا و ئەو، دوای لەدایك بوونی نوح ٥٩٥ ساڵ ژیا و چەندین کچ و کوری دیکەی بۆ هاتە دنیا. ئەو مرد و نوح کوری لەمك لەگەڵ عۆزرە کچی براکیل کوری مەحویل کوری خنوخ کوری ڤین پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. عوزرە بۆ ئەو سام و حام و یافس، منالەکانی نوحی هێنایە دونیا.

لەدایك بوونی نوح ١٢٦ ساڵ دوای مردنی ئادەم بوو. کاتێك گەورە بوو و گەشەی کرد باوکی لەمك پێی وت: دەزانی لەم کوێستانەدا جگە لەئێمە کەس نەماوەتەوە. کەواتە مەترسە و شوێنکەوتەی ئۆمەتی گوناحکار مەبە. نوح خەڵکەکەی خۆی بۆ خواپەرەستی هان دەدا و ئامۆژگاری دەکردن بەڵام ئەویان سووك وریسوا دەکرد. دەڵێن: نوح لەرۆژگاری بیوراسب دەژیا. لەماوەی ٩٥٠ ساڵ بۆ خواپەرەستی هانیدان. هەرجار نەوەیەك ژیانی بەسەردەچوو، نەوەی دواتر لەسەر هەمان ئایینی کوفر شوێنی ئەوانی دەگرتەوە تا ئەوەی خوا ئەشکەنجەی خۆی بەسەردا داباراندن.

عەبدواللە کوری عەباس لەگێرانەوەی کەلبی لەباوکی ساڵح دەڵێت: لەمك، نوحی هێنایە دونیا و لەم کاتەدا ٨٢ ساڵ تەمەنی بوو. لەو زەمانەدا کەس نەبوو خەڵك لەکاری خراپە دووربخاتەوە. خوا نوحی بۆئەوان نارد و لەم کاتەدا ٤٠٨ ساڵ تەمەنی بوو. بۆ ماوەی ١٢٠ ساڵ خەڵکی خواپەرەستی بانگێشت دەکرد و ئەوسا فەرمانی دروست کردنی کەشتی پێدرا. کەشتیەکەی دروست کرد و سەرکەوت و لەم کاتەدا ٦٠٠ ساڵ تەمەنی بوو. ئەوانەی دەبووا سزا بدرێن لەئاودا خنکان. نوح دوای دابەزین لەکەشتی ٣٥٠ ساڵیتر ژیا.

دەستەیەك لەرابردووان بەم شێوە باسیان کردووە: لەنێوان نوح و ئادەم دە نەوە دروست بوون کەهەموویان لەسەر ئایینی راستینی خوایی بوون. کوفر و ناباوەری سەردەمێك دەرکەوت کەخوا نوحی بۆلای ئەوان رەوانە کرد. یەکەم پێغەمبەر(د.خ) بوو بۆ ئاگادار کردنەوە و بانگ کردن بۆ تاقانە پەرەستی نێردرا. ئەم حەدیسیەیان لەعەبدواللە کوری عەباس و قتادە گێراوەتەوە.

## پاشایەتی جەمشید

زاناکانی ئێران دەڵێن: دوای تەهمورس، جەمشید لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. شید لەزمانی ئەوان تیشك روناکییە و جەم بەمانای مانگە ((کەواتە جەمشید بە مانای تیشکی مانگە)). بۆیە بەم ناوە ناویان بردووە چوونکە زۆر جوان بووە. ئەو جەم کوڕی وینجەهان و برای تەهمورسە. دەڵێن: ئەو بەسەر حەوت هەرێمەکەدا پاشایەتی کرد و هەموو زیندەوەرانی لەخەڵکان و پەریەکان دەستەمۆ کرد و تاجی لەسەرنا. لەیەکەمین تا پەنجاهەمین ساڵی پاشایەتی خۆی خەڵکی بەدروست کردنی شمشێر و زرێ و ساز و بەرگ و کەرەستەکانیتر لەئاسن فەرماندا و لەپەنجاهەمین تا سەدەمین ساڵی پاشایەتی خۆی خەڵکی فێر هەوریشم دروست کردن کرد و بیرێسن و بیچنن و کەتان و پەمو دروست بکەن و بە رەنگە جۆراوجۆرەکان رەنگی بکەن و بیپۆشن. لە سەدەمین تا سەد و پەنجاهەمین ساڵی پاشایەتی خۆی خەڵکی بۆ چوار دەستە دابەش کرد: شەڕکەران، دین پیشەکان (موبیدەکان)، مامۆستاکان ، پیشەوەران و جوتیاران. ئەو لەناو ئەمانە نۆکەری بۆ خۆی هەڵبژارد. بۆ هەر کارێك مۆری تایبەتی دروست کرد و لێی نوسی: لەسەر مۆری شەڕ ((میهرەبانی و هەڵس و کەوتی جوانی)) نوسی. لەسەر مۆری ماڵیات ((ئاوەدانی و دادپەروەری)) و لەسەر مۆری پەیك و پەیام((راستی و پارێزگاری)) و لەسەر مۆری دادپەروەری((جیهانداری و دادپەروەری))نوسی. مۆرەکان بەم شێوە بوون تا ئیسلام هات و هەموویانی لەناو برد.

لە سەد و پەنجاهەمین ساڵ تا دووسەد ساڵەی پاشایەتی لەگەڵ دێوەکان شەڕی کرد و ئەوانی لاواز و ناتەوان کرد و دێوەکانی دەستەمۆ کرد. لەدوسەد و پەنجا تا سێسەد و شانزە ساڵەی پاشایەتی دێوەکانی ناچار بەبڕینی دارەکان و داتاشینی بەردەکان لەکوێستان و دروست کردنی گەچ و ئاهەك و دروست کردنی بینا بەو کەرەستانە و دورست کردنی حەمام، ناچار کرد و فەرمانی پێدان دەریاپێوی بکەنە پیشە و لەکوێستان و کانەکان زێر و سیم و ئەوانەی بۆ تواندنەوە شیاون، دەربێنن و گەوهەر

و خشلی لێ دروست بکەن. فەرمانیدا جۆرەکانی دەرمان و خۆشبۆنکەرەکان هەڵبگرن و دروستیان بکەن. خەڵك فەرمانەکانی ئەویان بەکار بەست.

ئەو کات دەستوریدا گەردونەیەکی شووشەیی دروست بکەن. دێوەکانی بە زنجیر بەگەردوونەکەوە بەست و سواری بوو. رۆشتە ئاسمان و لەدۆنباوەند تا بابلی لەماوەی یەك رۆژدا بڕی و ئەم رۆژە هۆرمۆزد و فەروەردین مانگ بوو. خەڵك لەم رۆژە تا پێنج رۆژ دواتریان کرد بەجەژن.

لەرۆژی شەشەم خەڵکانی ئاگادار کردەوە کە لەگەڵ ئەوان بە شێوەیەك هەڵس و کەوتی کردووە، خوا پەسەندی کردووە و پاداشتی خوایی ئەوە بووە کەخوا خەڵکی ئەوەی لەگەرمی و ساردی و نەخۆشی و پیری و رژدی پاراستووە. خەڵك سێسەد ساڵ دوای ئەو سێسەد و شانزە ساڵەی یەکەم ژیان و لەدرێژی ئەم زەمانە هیچ کام لەو ئازارانەی دیاری کردبوو، پێی گرفتار نەبوون. پردێکی لەسەر رووباری دیجلە دروست کرد و بۆ رۆژگارێکی دوور و درێژ پایەدار بوو تا ئەسکەندەر وێرانی کرد. دوای ئەو پاشاکانیتر ویستیان پردێکی لەوشێوە دروست بکەن بەڵام نەیانتوانی و بەدروست کردنی پرد لەدار و تەختە بەسەندەیان کرد.

جەم لەروی نەزانی و یاخی بوون، بەخشینەکانی خوای لەسەر خۆی خستە ژێر پێ و ناسپاسی کرد و خەڵکان و دێو و پەریەکانی کۆکردەوە و ئاگاداری کردنەوە سەروەر و گەورەی ئەوانە کە بەهێزی خۆی ئەوانی لەنەخۆشی و پیری و مردن پاراستووە. ئەو لەقووڵای گومرایدا رۆچوو. کەس وەڵامی نەدایەوە. پێگەی لەناو خەڵك دابەزی و رووخا. ئەو فریشتانەی خوا ئەوانی بۆ هاوکاری کردنی ئەو لە فەرمانڕەوایی رەوانەی کردبوون، لەدەوری بڵاوەیان لێکرد. لەم کاتەدا بیوراسب، زوحاك کە ((ئاژی دهاك)) ناودەبرا، لەم کارە ئاگادار بوویە و روی کردە جەم تا بەدیان هەڵیبدرێت. جەم لەدەستی رایکرد بەڵام دواتر بیوراسب بەسەریدا زاڵ بوو و دڵ و ریخۆڵەکانی کێشایەدەر و بە مشار کردی بوو دووکەرتەوە. دەڵێن: ئەو خۆی بە خوا ناو برد و براکەی بە ناوی ((ئەسفنور)) لێی یاخی بوو تا بیکوژێت. جەمشید بۆ ماوەی سەد

ساڵ لەبراکەی رایدەکرد و ئاوارە بوو. لەکاتی ئاوارەیی بیوراسپ بەسەر وڵاتەکەیدا زاڵ بوو. دەڵێن: رۆژگاری پاشایەتی ئەو ٧١٦ ساڵ و چوار مانگ درێژەی کێشا.

دەڵێم: ئامازەم بەم بەشە لەداستانەکەی جەم دا لەکاتێکدا پێشتر دەمویست پشت گوێی بخەم چوونکە ئامازە بەبابەتی ئەوتۆ دەدات دەبێتە هۆی ئازاردانی گوێچکەکان و عەقڵ و سرشتەکان پێی رازی نابن. ئەمە گومانی پارسیەکانە . بۆیە ئاماژەمان بەمەدا تا نەزانی ئێرانییەکان نیشان بدەین چوونکە ئەمانە بەردەوام نەزانی لەسەر عەرەبەکان دەکەن بە ئیراد لە گەڵ ئەوەی نەگەشتونەتە ئەو پلە و پایە لەنەزانی. ئەگەر هێنانی ئەم بەشەمان پشت گوێ دەخست، کتێب لەو شتانەی لەبارەی مێژووی ئەوان ئاماژەمان پێدەدا، بێبەش دەبوو.

## رووداوەکانی رۆژگاری نوح

زاناکان لەبارەی ئاینی خەڵکێك نوحیان بۆ رەوانە کرا بەجیاوازی قسەیان کردووە. دەستەیەك وتوویانە: ئەمانە پێکەوە هاودەست ببوون تا کارە ناپەسەندەکانی خوای گەورە ئەنجام بدەن وەك ئەنجامدانی کارە قێزەونەکان، کوفر، مەیخواردنەوە و سەرقاڵ بوون بەگەمە و بێهۆکاری و پشت کردنە فەرمانەکانی خوا. کەسانیتر دەڵێن: ئەمانە فەرمانبردای خوا بوون بەڵام بیوراسب یەکەم کەس بوو ئایینی صائبیانی ئاشکرا کرد و ئەو کەسانەی نوحیان وەك پێغەمبەر(د.خ) بۆهات، شوێنی کەوتن. ئێمە ئاماژە بەکارەکانی بیوراسب دەدەین. بەڵام خوای گەورە لەکتێبەکەیدا وەك بتپەرستەکان ئاماژەیان پێدەدات. دەفەرمێت: پەرستینی خواکانی خۆتان پشت گوێ مەخەن و لەپەرستینی ود، سوع، یەغوس و نەسر خۆبەدوور مەگرن. ئەمانە دەستەیەکی زۆریان لەرێ بەدەر کرد(نوح/٧١/٢٢—٢٤).

دەڵێم: جیاوازی لەنێوان ئەم سێ وتارەدا نییە چوونکە وتارێکی راست کەگومانی تێدا نییە، ئەوەیە ئەوان بتپەرست بوون و وەسفی بتەکانیان دەکرد و دەیانپەرستی وەك چۆن قورئان ئاماژەی پێداوە و ئەمە ئایینی صائبیەکانە چوونکە بناغەی دینی

صائبیەکان پەرستینی ئافرێنەرە بەهەشتیەکانە کەهەمان فریشتەکانن. فریشتەکانیان دەپەرەستی تا هەرچی زیاتر لەخوا نزیکیان بکەنەوە (زمر/ ٣٩/ ٣). خەڵکی نوح ملکەچی فەرمانەکانی خواوەند بوون چوونکە ئەو فرەزانی پیرۆزە بەلأم وتیان: ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە، ناسینی ناتەوانی خۆمانە لەگەشتن بەقووڵایی گەورەیی خواوەند. ئێمە لەرێگەی نێوەنجیگەرد نزیکەکان لەبارەگای ئەو، لەو نزیك دەبینەوە و ئەم کەس نزیکانە هەمان ئافرێنەرە بەهەشتیەکانن. بەلأم چوونکە ئافرێنەرە بەهەشتیەکانیان نەدەبینی و دەستیان بەوان نەدەگەشت، لەرێگەی پەیکەرەکان کەحەوت ئەستێرەکەی سوڕێنەری جیهانن، لەوان نزیك بوونەوە چوونکە بەگومانی ئەوان، ئەوان سووڕێنەری ئەم دنیایەن. ئەوکات دەستەیەك لەپەیکەر پەرەستەکان، بوونە بێژەری ئەم وتارە کەپەیکەرەکان ئاشکرا دەبن و تیشکی خۆیان لە دنیادا بلأو دەکەنەوە. شەوانە دەبینرێن و بەرۆژدا نابینرێن. ئەمانە بتەکانیان داتاشی و دایاننا تا لەبەرچاویاندا بن و لەرێگەی ئەمانەوە بەپەیکەرەکان، و لەرێگەی پەیکەرەکانەوە بەئافرێنەرە بەهەشتییەکان و لەرێگەی ئەوانەوە پەیوەستی خواوەندی جیهان بن.

ئەمە بوو ژێر بناغە و بونیادی پایەدانانی بتەکان لەسەرەتاوە. ئەوسا لەم رۆژگارانەی دوایی کەسانێك لەناو عەرەبەکان دەرکەوتن کەلەسەر ئەم باوەڕە بوون. خوای گەورە فەرموی: ئەوان وتیان: ئەم بتانە ناپەرەستین جگە لەوەی ئێمە هەرچی زیاتر لەخوا نزیك بکەنەوە (زمر/٣/٣٩). لەسەر ئەم بنەمایە لەبتپەرەستی ئایینی صائبیەکان دەرکەوت و کوفر و کارە قێزەونەکان و گوناحەکانیتر بلأو بوویەوە. لەبەر ئەوەی خەڵکی نوح سوور بوون لەسەر گوناح و پێیان لەسەر داگرت، خوا نوحی بۆ ناردن تا ئەوان لەگەورەیی و مەزنی خواوەند جیهان و توانایی بێ کۆتایی بۆ لەناو بردنی یاخی بووان بترسێنێت وئەوان بۆ گەڕانەوە و تۆبە رێنوێنی بکات. خوا نوحی لەپەنجا ساڵیدا کردە نێردراوی خۆی ( ئەو لەناو ئەوان درەنگی کرد بۆ ماوەی هەزار ساڵ جگە لە پەنجا ساڵ) (نۆسەد و پەنجا ساڵ)( عەنکبووت/١٤٥/٢٩).

عەون کوڕی شداد دەڵێت: خوای گەوورە نوحی لە٣٥٠ ساڵیدا کردە پێغەمبەر(د.خ) و

ئەو ٩٥٠ ساڵ لەناو خەڵکەکەی خۆیدا مایەوە و دوای ئەوە ٣٥٠ ساڵیتر ژیانی بەسەربرد. ئاماژەیان بەگێڕانەوەی جیاواز لەمەداوە کەپێشتر باسمان کرد.

کوڕی ئیسحاق و کەسانیتر دەڵێن: خەڵکی نوح زۆر خراپەیان لەگەڵدا کرد و لێیاندەدا و بەمەبەستی خنکاندن قورگیان گوشی تا لەهۆش چوو، دوای ئەوەی هاتە خۆ، دەیوت: خوایە، هاوڕێ لەگەڵ خەڵکەکەم لێمخۆشبە کە ئەم کارانە لەروی نەزانییەوە دەکەن. کارەکەی زۆری خایاند و خەڵکی نوح لەقوڵایی گوناح و خراپەکاری خۆیان رۆچوون و کار لەسەر ئەوان و ئەم دژوار و تاقیکردنەوە خواییەکان لەسەریان گران بوو. ئەوە لەدوای ئەوە چاوەروانی دەکرد بەڵام هیچ ئەومیەك نەدەهات مەگەر ئەوەی لەئەوەی پێشتر گلاوتر وخراپتر بوو. کار گەشتە شوێنێك خەڵك دەیانوت: ئەم پیاوە لەگەڵ باو و باپیرانی ئێمە بوو و پیاوێکی شێتە. خەڵك گوێیان لەقسەکانی نەدەگرت و بەهیچ شتێکی ئەو رازی نەدەبوون. لێیان دەدا و لەپارچەیەکیانەوە دەئاڵاند و بە گومانی ئەوەی مردوە لە ماڵەکەیدا فرێیان دەدا. کاتێك دەهاتە هۆش خۆی، سەر و روخساری دەشۆرد و خۆی پاك دەکردەوە، دەهاتە دەرەوە و دووبارە بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا هانی دەدان. کاتێك کارەکەی زۆری خایاند و کوڕەکانی لەباوکەکان بەخراپتر بینی، وتی: خوایە، تۆدەبینی بەندەکانت لەگەڵ من چی دەکەن، ئەگەر پێویستت بەوانە بۆ رێگەی راست رێنوێیان بکە و ئەگەر وانییە، چاوەروانی و سەبر بەمن ببەخشە تا خۆت داوەری لەنێوانیاندا بکەیت. خوا پێی فەرموو: لەخەڵکی تۆ کەس نایێتە سەر باوەرەکەی تۆ مەگەر ئەوانەی پێشتر هاتوون (هود/١١/٣٦).

کاتێك لەباوەرهێنانی ئەوان هیوابڕاو بوو و گلەیی لەوان بردە لای خوا و داوای هاوکاری لێکرد، خوا وەحی پێکرد: کەشتی دروست بکە و بۆ ستەمکاران لەمن داوای لێخۆشبوون مەکە چوونکە هەموویان لەناو ئاودا دەخنکێن.((هود/١١/٣٧).

نوح دەستی بەدروست کردنی کەشتی کرد و لەبانگێشت کردنی خەڵك بۆ خواپەرەستی چاوی پۆشی. دروست کردنی کەشتی لە دار و ئاسن و شتی تر

دەستپێکرد و خەڵکەکەی لەکاتێکدا ئەو سەرقاڵی کارکردن بوو، لای تێدەپەڕین و گاڵتەیان پێدەکرد. نوح وتی: ئەگەر گاڵتە بەئێمە بکەن ئێمەیش گاڵتە بەئێوە دەکەین و ئەمە بەم زووانە دەبینن.((هود/١١/٣٨)). دەڵێن: خەڵك پێیان دەوت: یا نوح دوای پێغەمبەری بوویتە دارتاش.

خوا منداڵانی ژنانی نەزۆك کرد و لەبەر ئەم هیچ ژنێك منداڵی نەبوو. کەشتی لە داری ساج دروست کرد. خوا فەرمانی پێدا درێژییەکەی ٨٠ گەز بێت و پانییەکەی ٥٠ گەز و بەرزییەکەی ٣٠ گەز. قتادە دەڵێت: درێژیەکەی ٣٠٠ گەز بوو، پانییەکەی ٥٠ گەز و بەرزییەکەی ٣٠ گەز. حەسەن دەڵێت: درێژییەکەی ١٢٠٠ گەز بوو و پانییەکەی ٦٠٠ گەز. و خوا زاناترە.

فەرمان بە نوح درا کەشتییەکی سێ قات دروست بکات: خوارەوە و ناوەراست و سەرەوە. نوح ئەو کارەی کرد کەخوا فەرمانی پێدابوو، کەشتییەکەی دروست کرد. خوا پێشتر ئەم فەرمانەی لەگەڵدا باس کردبوو: کاتێك کاتی فەرمانەکەی ئێمە بگات و لەتەنووری گەرم ئاو هەڵقوڵا، لەهەر زیندەوەرێك لەنێر و مێی، جوتێك هەڵبگرە. کەسەکانی خۆیشت هەڵبگرە مەگەر ئەوانەی پێشتر لەبارەیانەوە فەرمان دراوە. هەروەها شوێنکەوتوانی خۆت لەگەڵ خۆتدا هەڵبگرە، هەرچەندە کەم بوون ئەوانەی شوێن نوح کەوتبوون. ئەوسا لەتەنوری گەرم — کەدەڵێن لەبەردێکی حەوا بوو— ئاو هەڵقوڵا. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: تەنورەکە لەهیند بوو. موجاهید و شەعبی دەڵێن: تەنور لەسەرزەمینی کوفە بوو. هاوسەرەکەی نوح ئاگاداری کردەوە لەتەنوورەکە ئاو هەڵدەقوڵێت. خواوەند بەجبرەئیلی فەرموو کەعبە هەڵبگرێت و تا ئاسمانی چوارەم بەرزی بکاتەوە. کەعبە وەك ئامازەمان پێدا لەیاقوتی بەهەشتی بوو. هەروەها بەردی رەش ((حجرەالسود))ی لەکێوی باوکی قەبیس داشارد و ئەم بەردە لەوێ بوو تا ئیبراهیم ماڵەکەی سەرلەنوێ ئاوەدان کردەوە و بەردەکەی هەڵگرت و لەشوێنەکەی خۆیدا داینا. کاتێك لەتەنوری گەرم ئاو هەڵقوڵا، نوح بەفەرمانی خوا، ئەوانەی دەبووا لەگەڵ خۆی بیانبات، بردە ناو کەشتیەکە. سێ منداڵەکەی حام و سام و یافس لەگەڵ هاوسەرەکانیان و شەش کەس لەخەڵکان کە بە نوحەوە دەبوونە

سیانزە کەس.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: کەسانی ناو گەشتی ٨٠ کەس بوون کەیەکێك لەوان ((جۆرهۆم))بوو. هەموویان لەمناڵەکانی شیس بوون. قتادە دەڵێت: هەشت کەس بوون: نوح و ژنەکەی و سێ کوڕەکەی و هاوسەرەکانیان. ئەعمەش دەڵێت: ٧ کەس بوون. لەگێرانەوەکەی ئەو ناوێك لەهاوسەرەکەی نوح نییە. نوح پەیکەری ئادەمی لەگەڵ خۆیدا بردە ناو کەشتییەکە و دواتر ئەو زیندەوەرانی بردە ناو کەشتیەکە کەخوا فەرمانی پێدابوو. کوڕەکەی یام کەپیاوێکی کافر بوو، نەرۆشتە ناو کەشتییەکە. دووایین کەر دووایین ئاژەڵ بوو سەرکەوت. کاتێك سکی کەر رۆشتە ناو کەشتییەکە، ئیبلیس خۆی بەکلکیەوە نوساند و لەبەر ئەمە قاچەکانی نەیانتوانی بڕواتە ناو کەشتییەکە. لێرەدا نوح فەرمانی پێدەدا وەرەناو. بەڵام کەر نەیدەتوانی. کار گەشتە ئەو شوێنەی نوح هاواری کرد: وەرە ناو هەرچەندە دێو لەگەڵ تۆدابێت! دێو وتی: وتەیەك بوو لەروی نەزانییەوە کەوتە سەرزمان. کاتێك نوح ئەو قسەی کرد، کەر هاتە ناو و دێویش لەگەڵیدا هاتە ناو. نوح پرسی: ئەی دوژمنی خوا، کێ تۆی هێنایە ناو کەشتییەکە؟ دێو وتی: مەگەر تۆ بەکەرت نەوت وەرەناو ئەگەر دێویشت لەگەڵدا بێت؟ نوح دێوی لەحالی خۆیدا بەجێهێشت.

کاتێك بەنوح فەرماندرا ئاژەڵەکان بباتە ناو کەشتییەکە، وتی: خوایە، لەگەڵ شێر و مانگادا چی بکەم؟ لەگەڵ گورگ و مەڕدا چیبکەم؟ لەگەڵ پشیلە و مریشك؟ فەرمووی: ئەوەی دوژمنایەتی دەخاتە نێوانیان، دەتوانێت ئاشتیش لەناویاندا سەقامگیر بکات. خوا شێری تووشی تا کرد و بەو نەخۆشییەوە سەرقاڵی کرد. لەبەر ئەمەیە وتراوە:

و ما الکلب محموما و تن طال عمرة          الا انما الحمي علي الاسد الورد

واتاکەی: هەرچەندە ژیانی سەگ بخایەنێت، تای توش نابێت. تەنیا شێری ژیانە توشی تا دەبێت.

نوح باڵندەكانی لەقاتی خوارەوە جێگیر كرد و ئاژەڵە دەشتی و كێوی و دارستانییەكانی لەقاتی ناوەراست. خۆی و كەسەكانی هاورێی لەقاتی سەرەوە نیشتەجێ بوون. نوح لەكەشتیدا ئارام بوو و هەموو ئەو كەسانەی فەرمانی بردنیانی پێدرابوو لەگەڵ خۆیدا بردە ناو كەشتییەكە و ئەم رووداوە لە ٦٠٠ ساڵی ئەودا روویدا. بە وتەی هەندێ كەس، یا لەساڵێكیتر لەژیانی ئەودا روویدا بەهەمان شێوە كەئاماژەمان پێدا. ئەو هاورێكانی خۆی بردە ناو كەشتییەكە و لەم كاتەدا ئاو لەئاسمان و زەوی دەستی بە بارین و هەڵقوڵان كرد. خوای گەورە فەرموویەتی: دەرگاكانی ئاسمانمان بەئاوێك كردەوە كەهەرسات زیاتر دەبوو، زەویمان كردە كانی و لەم كاتەدا ئاوی ئاسمان و زەوی بە یەك دەگەشتن و بەرز دەبوونەوە (قمر/٥٤/١١-١٢). لەنێوان بارینی باران و هەڵقوڵینی ئاو تا هاتنە سەرەوەی كەشتی لەسەر ئاو، چل شەو و چل رۆژی خایاند و ئاو هەرسات زیاتر و دژوارتر دەبوو. ئاو هاتەسەر و هەموو شتێكی داپۆشی. نوح پۆششی كەشتی دابەسەر خۆی و هاوەڵانی و كەشتی گرفتاری شەپۆلە كێو ئاساكان، ئەوانی دەسووراند. نوح بانگی منداڵەكەی كرد و وتی: (لەم كاتەدا سوچێكی گرتبوو) كورم لەگەڵ ئێمەدا سوار بە و لەكافرەكان مەبە. وتی: پەنا بۆ كێوێك دەبەم تا لەئاو بمپارێزێت. بەردەوام بەكێودا هەڵدەگەرا و پەناگای بۆخۆی دروست دەكرد. نوح پێی وت: ئەمرۆ لەبەرابەر فەرمانی خوا هیچ پارێزەرێك نییە مەگەر ئەو كەسەی خۆشەویستی خوا روی تێبكات. لەم كاتەدا شەپۆلی ئاو جیایی خستە نێوان ئەو دووانە و كوری نوح رۆشتە ناو ریزی خنكاوان بەدەست ئاو.(هود/١١/٤٢—٤٣).

ئاو تا سەر لوتكەی كوێستانەكانی گرتەوە و لەبەرزترین لوتكە تا پانزە گەز بەرز بوویەوە. هەمووی ئەوانەی لەگیاندار و رووەك لەسەر زەوی بوون لەناو چوون و جگە لەنوح و هاورێكانی كەس نەمایەوە. بەپێی وتەی شوێنكەوتوانی تەورات، ئەعوج كوری عتق لەگەڵ نوحدا بوو. بارین و هەڵقوڵانی ئاو لەسەر زەوی و رۆچوونی شەش مانگ و دە رۆژی خایاند. عبداللە كوری عەباس دەڵێت: بەفەرمانی خوا چل شەو و رۆژی بەردەوام باران باری. لەمكاتەدا ئاژەڵە دەشتی و كێوییەكان كەگیرۆدەی باران و

قوڕ ببوون، رویان کردە نوح و دەستەمۆ بوون. نوح بەهەمان شێوەی خوا فەرموبووی، ئەوانی بردە ناو کەشتی و ئەوان لەشەوی دوانزەیەم لەمانگی رەجەب سوار کەشتی بوون کەبەرابەرە لەگەڵ سیانزەی مانگی (ئاب). لەرۆژی دەیەمی محرەم (عاشورا) لەکەشتی هاتنەدەر و لەبەر ئەمەبوو هەندێ خەڵك لەم رۆژەدا ئایینی رۆژو گرتنیان دامەزراند. ئاو دوبەش بوو: نیوەی لەئاسمان و نیوەی تری لەزەوی. کەشتی سەراسەری زەوی پێوا و لەهیچ شوێنێك ئارامی نەگرت تا هاتە حەرەم بەلاَم نەرۆشتە ناوی بەڵکو بۆماوەی یەك حەفتە بەدەوریدا سووڕا. ئەوکات لەسەر زەویدا رۆشت و نەفەرەکانی لەگەڵ خۆیدا برد. گەشتە جودی. کێوێکە لە (قرِدەی) لەسەرزەوینی موسڵ. کەشتی لەجودی نیشتەوە و لەمکاتەدا وترا: نەفرەت و دووری لەو کەسانەی ستەمیان لەخۆیان کرد ((هود/١١/٤٣)). کاتێك کەشتی ئارامی گرت، فەرمان لەلایەن خواوە هات: ئەی زەوی ئەو ئاوەی خۆت هەڵمژەرەوە و ئەی ئاسمان تۆیش ئاوەکەی خۆت بگێرێنەوە کە بارانووتە. ئاو لەناو زەویدا نەماو و فەرمانی خوا جێبەجێ کرا بەو شێوەی خۆی دەیویست((هود/١١/٤٣)). ئاوی سەر زەوی، زەوی قوتی دایەوە. نوح لەناو کەشتییەکەدا مایەوە تا ئاو دامرکایەوە. کاتی هاتەخوار بە قەراغێك لەناو بەرەو قەردی لەزەوی دورگە رۆشت، شوێنێکی هەڵبژارد و دێهاتێکی بەناوی ((ثمانین)) بازاری هەشتاد بنیات نا. بۆیە ئەم ناومیان لەسەرنا چوونکە هەرکام لەهەشتاد کەسی ناو کەشتی ماڵێکی بۆخۆی دروست کرد. دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێن جگە لەدوای تۆفانی نوح ، نوح منالی نەبوو. دەڵێن: سام ٩٨ ساڵ پێش تۆفان لەدایك بوو. هەروەها وتراوە: ناوی ئەو کورەی لەناودا خنکا کەنعانە کەهەمان یامە.

ئاگرپەرەستەکان (گبران) تۆفان ناناسن و دەڵێن: پاشایەتی لەرۆژگاری کیومەرس کەهەمان ئادەمە بەردەوام لەناو ئێمەدا بووە. ئەگەر تۆفان لەئاراد بوویێ نەژادی ئێمە لێك دەپچڕا و پاشایەتی ئێران لەناو دەچوو. هەندێکیشان بەتۆفان رازی دبوون و دەیانوت تۆفان لەهەرێمی بابل و دەوروبەری بووە بەلاَم شوێنی منالەکانی کیومەرس لەرۆژهەلاَت زەمین بووە و لەبەر ئەمە تۆفان بەوان نەگەشتووە.

وتەی خوای گەورە لەهەمووان راسترە کەدەفەرمێت منالەکانی نوح تەنیا پاشماوەکان بوون و لەناو منالەکانی ئەو جگە لەوانەی لەناو کەشتییەکە بوون، منالێکیان لێبەجێ نەما. ئەوان سام و یاسف و حام بوون.

کاتێك سەردەمی مردنی نوح نزیك بوویەوە پێیان وت: دنیات چۆن بینی؟ وتی: وك مالێکی دوو دەرگا لەیەکێکی هاتمە ناو و لەیەکێکی رۆشتمە دەر. ئەو سامی (گەورەترین کوری خۆی) وەك جێگری هەلبژارد.

## بیوراسب یا ئاژی دهاکی تازی کە عەرەبەکان پێی دەلێن زوحاک

خەلکی یەمەن دەلێن زوحاک لەناو ئەواندا بوو و ئەو بەیەکەم فیرعەون هەژمار دەکرێت. ئاژی دهاك لەکاتی هاتنی ئیبراهیمی خەلیل بۆ میسر، پاشای ئەم ولاتە بوو. ئێرانییەکان دەلێن ئاژی دەهاك لەوان بوو. ئەوان ئەم بەهی خۆیان دەزانن. دەلێن نەژاد نامەی ئەو بەم شێوەیە: بیوراسب کوڕی ئەروەند ئەسب کوڕی رینکار کوڕی وندریشتەك کوڕی یارین کوڕی فەروال کوڕی سیامەك کوڕی میشی کوڕی کیومەرس. مێژوونوسان دەلێن: ئەو پاشایەتی حەوت هەرێمەکەی دەکرد و پیاوێکی جادوگەر و خراپەکار بوو.

هوشام کوڕی کلبی دەلێت: بەگومانی ئەوان ئاژی دەهاك دوای جەم هاتە سەر کار و هەزار سال فەرمانرەوایەتی کرد. خوا زاناترە. ئەو لەسواد لەدێهاتێك بەناوی (بۆرس) لەسەر زەوییەك لەسەر رێگەی کوفە دابەزی و سەراسەری زەوی گرت و بەستەم و زولم پاشایەتی کرد و دەستی بەکوشتن و بڕینی خەلکان کرد. یەکەم کەس بوو ئایینی شوومی دەست و پێ بڕین و لەسێدارەدانی هێنایە ئاراوە. یەکەم کەس بوو مالیاتی وەرگرت و سکەی بەناوی خۆیەوە لێدا. یەکەم کەس بوو گۆرانی خوێند و کەسانیتریش بۆیان خوێند. دەلێت: وەك مێژوو بۆمان ماوەتەوە ئاژی دهاکی تازی هەمان نمرودە و ئیبراهیم لەسەردەمی ئەو لەدایك بووە. ئەو ئیبراهیمی خستە ناو ئاگر و مەبەستی سووتاندنی ئەوی کرد.

ئێرانیەکان گومان دەکەن پاشایەتی تەنیا لەو پشتە دروست بوو کەهوشەنگ و جەم و تەهمورسی دروست کرد. ئاژی دهاك پیاوێکی ستەمکار بوو بەجادووگەری و فریو بەسەر خەڵکی ولاٌتدا زاڵ و بەو دوو مارەی لەسەر دوو شانی ڕوابوون، زیانی زۆری لە خەڵکدا.

زۆربەی خاوەن کتێبەکان دەڵێن: ئەوەی سەر شانی ئاژی دهاك دوو لەت گۆشتی بەرزی هاوشێوەی سەری مار بوو. ئەو دوو لەتە گۆشتەی بەجلٌ و بەرگ دادەپۆشی و بۆ ترساندن دەیوت دوو مارن و داوای خواردنی لێدەکەن. ئەو دوو لەتە گۆشتە لەکاتی برسیەتیدا لەژێر جلەکانی دەجووڵانەوە. خەڵك زیانی زۆریان لێبینی. ئەو منالٌی زۆری سەربڕی وبەم شێوە بیانوی هێنایەوە کەدوو تیکە گۆشتە هەڵواسراوەکەی سەر شانی ئازاری دەدەن و هەر کات بەمێشکی دوو مرۆڤ تێریان بکات ئارام دەگرن. ئەو ڕۆژانە دوو پیاوی سەردەبڕی. خەڵك بەم شێوەیە رازی بوون تا ئەوەی خوا مەبەستی لەناو بردنی کرد. پیاوێك لەئیسفەهان بەناوی (کابی)(کاوە) شۆرشی هەلاٌیساند. پاڵنەری بۆ ئەم کارە دو کوڕەکەی بوون کەهاوەلاٌنی بیوراسب ئەوانیان بۆ دوو تیکە گۆشتەکەی سەرشانی گرتبوو. ئەو داردەستەکەی دەستی بەرز کردەوە و چەرمی پێوە هەڵواسی و خەڵکی بۆ شەڕ لەگەڵ بیوراسب هاندا. خەڵکێکی زۆر بەدەم داواکارییەکەی ئەوەوە هاتن چوونکە لەناو ستەم و رەنجی زۆردا ژیانیان بەسەریان دەبرد. کاتێك کاوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، خەڵك لەو ئالاٌیە ڕێزیانگرت و سوودی زۆریان لێ بەدەست هێنا تائەوەی لای پاشاکانی ئێران بوو بەگەورەترین ئالاٌ و بەناوی (درەفشی کاویانی) ناویان دەبرد و جگە لە کارەگەورەکان ئالاٌکەیان بەرز نەدەکردەوە و تەنیا شازادەکان لەکاتی ئەنجامدانی کارە گەورەکان ئالاٌکەیان هەڵدەکرد.

بەسەرهاتی کاوە: خەڵکی ئیسفەهان بوو. جەماوەرێکی زۆر خەڵك لێی کۆبوونەوە و کاتێك هاتە سەر ئاژی دهاك، ترسی ئەو کەوتە دڵی ئاژی دهاك. ئاژی دهاك لەماڵەکەی خۆی رایکرد و جێگەکەی بۆ شوێن کەوتووانی کاوە بەجێهێشت. ئێرانییەکان لەدەوری کاوە کۆبوونەوە و ئەو ئەوانی ئاگادار کردەوە کەکاری

بەپاشایەتی و فەرمانرەوایی نییە چوونکە خۆی بۆ ئەم کارە بە شیاو نازانێت. وتی دەخوازێت یەکێك لەمناڵەکانی جەم پاشایەتی بگرێتەدەست چوونکە جەم منالی پاشا هوشەنگی گەورە کوری فەرواڵ بوو ئایینی پاشایەتی بوونیات نا و لەپێش کەسانیتر بەم کارە هەستا.

فەرەیدون کوڕی ئەسفیان (ئاتبین) دوور لەچاوی ئاژی دهاك دەژیا و لەم کاتەدا چاوی بە کاوە کەوت. ئەو و هاوەڵانی لەبینینی فەرەیدون شادمان بوون و بۆ پاشایەتی هەڵیانبژارد. کاوە وگەورەکانی ئێران بوونە نزیکەکانی فەرەیدون لەکاروباری پاشایەتی. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست و کاروباری پاشایەتی بەهێز و سەقامگیر کرد، دەستی بەسەر ماڵەکانی ئاژی دهاکدا گرت و شوێن پێی هەڵگرت و گرفتار و لەکوێستانی دۆنباوەند (دەماوەند) زیندانی کرد.

دەستەیەك لەئاگرپەرەستان گومان دەکەن فەرەیدون دەستەیەك لەپەرییەکانی بۆ زیندانبانیی ئاژی دهاك دیاری کردووە. دەستەیەك دەڵێن ئەو لەگەڵ سلێمان کوڕی داوود چاویان بە یەك کەوتووە و سلێمان کە لەو کاتەدا لەشام دەژیا، ئاژی دهای لەزیندانی دۆنباوەند زیندانی کرد. ئاژی دهاك بەند وزنجیر لەدەست خۆی گەیاندە خوراسان. کاتێك سلێمان ئەمەی بینی دەستوری بەپەرییەکاندا دا بیبەستنەوە تا نەتوانێت لەشوێنەکەی خۆی بجووڵێت. ئەمانە تەلیسمێکیان لەسەر دروست کرد و لەقیافەی دوو پیاو لەو زیندانەی بۆ هەمیشەی تیایدا بوو، دایاننا چوونکە گومانیان دەکرد هیچ کات نامرێت.

ئەمەیش لەدرۆ فێنکەکانی ئێرانیەکانە. ئەمان سەبارەت بەئاژی دهاك درۆی گەورەتریان هەیە کەئاماژەیان پێنادەین.

دەستەیەك لەئێرانییەکان گومان دەکەن فەرەیدون ئەوی لەرۆژی نەورۆز کوشت. لەبەر ئەمە ئەو رۆژەیان کردە جەژن و وتیان: (نەورۆز هات) یانی ئەوەی رۆژ و رۆژگارێکی تازە دەست پێدەکەین. گرفتار بوونی ئاژی دهاك لەرۆژی (مهرگان)بوو، ئێرانییەکان وتیان: (مهرگان بۆ کوشتنی کەسێك هات کە خەڵکی سەردەبڕی.)

ئێرانییەکان گومان دەکەن لەکارەکانی ئاژی دهاك هیچ کات شتێکی باشیان نەبیستوە جگە لەیەك کار، ئەویش کاتێك ستەمکاری ئەو لەسەر خەڵکان فروان بوو، گەورەکانی وڵات سەبارەت بەکردەوەکانی ئەو نامەیان بۆ یەکتر نووسی و پەیك و پەیامیان نارد. هەموویان بڕیاریاندا بڕۆنە دەرباری ئاژیدهاك. کۆك بوون لەسەر ئەوەی کاوەی ئیسفەهانیش ببینێت. کاوە ڕۆشتە بینینی بەڵام سڵاوی لێنەکرد بەڵکو لێی پرسی: ئەی پاشا بە کام سڵاو و درووود وەسفت بکەم؟ سڵاوێك بۆ پاشایەك کەبەسەر هەموو هەرێمەکان فەرمانڕەوایی دەکات یا ئەو پاشای تەنیا فەرمانڕەوایی یەك هەرێم دەکات؟ پاشا وتی: بەسڵاوێك بۆ ئەو پاشای فەرمانڕەوایی هەموو هەرێمەکان فەرمانڕەوایی دەکات چوونکە پاشای سەراسەری زەمینم. کاوە وتی: ئەگەر تۆ پاشای هەموو هەرێمەکانیت، بۆ لەناو هەموویاندا کارە گران و قورسەکانت خستۆتە سەر شانی ئێمە؟ بۆ کارەکانت لەنێوان ئەوان و ئێمەدا دابەش نەکردووە؟ کاوە گوناح و تاوانی جۆراوجۆرەکانی دیاری کرد و ئاژی دهاك هەموویانی بەڕاست زانی. قسەکانی کاریگەری لەسەر ئاژی دهاك کرد و پاشا بەخراپەکاری خۆی ڕازیبوو و مژدەی دڵخۆشکەری بەخەڵکدا و فەرمانیدا بگەڕێنەوە تا نیازەکانیان بەراوەردە بکات و خواستەکانیان بێنێتە دی. ئەوان بەرەو شارەکانی خۆیان بگەڕێنەوە.

دایکی لەم کۆبوونەوەدا ئامادە بوو و سەرکۆنەکانی ئەوانی دەبیست. ئەو لەئاژی دهاك خراپتر بوو. کاتێك خەڵك ڕۆشتنە دەر، بەتووڕەیی هاتە ناو و سەرکۆنە کرد، وتی: بۆ هەموویانت لەناو نەبرد؟ بۆ دەستی ئەوانت نەبڕییەوە؟ کاتێك ژن قسەکانی خۆی درێژە پێدا، ئاژی دهاك پێی وت: ئەی دایە، تۆ هیچ ئەندێشەیەکت لەسەردا نەبووە مەگەر ئەوەی پێشتر لەبیریدا بووبێتم. بەڵام ئەم خەڵکە قسەی ڕاست و ئاشکرای خۆیان لەگەڵ مندا باس کرد و منیان پێ سەرکۆنە کرد. هەر کات ویستم بەسەریاندا دابەزم و لەناویان بەرم، بینیم ڕاستی و دروستی وەك کێوێك لەناو من و ئەواندا قوت بۆتەوە و نەمتوانی هیچ کارێکیان لەگەڵدا بکەم. ئەو کات گوێی لەداواکاری و قسەی خەڵکی بەشە جۆراوجۆرەکانی وڵات کرد و مژدەی دڵخۆشکەری پێدان و زۆربەی نیازەکانی ئەوانی هێنایە دی.

دەستەیەك دەڵێن: فەرمانرەوایی ئەو ٦٠٠ساڵی خایاندووە و ساڵەکانی ژیانی تا هەزار درێژ بۆتەوە. لەپاشماوەی ساڵەکانی وەك پاشا بوو چوونکە هێزی زۆر و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکران. هەروەها دەڵێن: پاشایەتی ئەو ١١٠٠ ساڵی خایاندووە.

بۆیە باسی بەسەرهاتی بیوراسبمان کرد چوونکە دەستەیەك گومان دەکەن نوح لەسەردەمی ئەودا ژیاوە. نوح بۆ ئەو وخەڵکی وڵاتەکەی نێردراوە. دەڵێن ئەو ئەم شارانەی دروست کرد: بابل، سور، دەمەشق.

## داستانی بنەماڵەی نوح

پێغەمبەر(د.خ) لەبارەی ئەم فەرموودەی خوای گەورە لەقورئان کە فەرموویەتی: پاشماوەکانی زەویمان لەبنەماڵەی نوح دانا (صافات/٣٧/٧٧). فەرمووی: ئەوان سام و حام و یافس بوون. وەهب کوڕی مونەبە وتی: سام کوڕی نوح باوکی عەرەبەکان، ئێرانییەکان و رۆمەکانە. حام باوکی ڕەشەکانە و یافس باوکی تورك و یاجوج و ماجوج. دەڵێن: قبتیەکان لەمناڵەکانی قبتی کوڕی نوحن. رەشی بۆیە رویکردە مناڵەکانی حام لەبەر ئەوەی نوح خەوت و شەرمی دەرکەوت. حام بینی و داینەپۆشی و سام و یافس بینیان و بە پەرۆیەك دایانپۆشی. کاتێك لەخەو هەستا زانی حام و براکانی چییان کردووە.

(( نوح سەرقاڵی جوتیاری لەسەر زەوی بوو، رەزێکی بڕی و شەرابی خواردەوە و مەست بوو. لەخێوەتەکەی خۆی روت بوویەوە. حام باوکی کەنعان ڕووتی باوکی خۆی بینی و دوو براکەی خۆی لێ ئاگادار کردەوە. سام و یافس عابایەکیان هەڵگرت و لەسەر شانی خۆیان دایاننا و بۆ دواوە رۆشتنە پێش و ڕووتی باوکی خۆیان داپۆشی لەکاتێکدا پشتیان لەباوکیان بوو و شەرمی باوکی خۆیان نەبینی. نوح لەمەستی خۆی هاتە هۆش و زانی کورە گەورەکەی چی لەگەڵدا کردووە. وتی: کەنعان مەلعون بێت. بۆبراکانی خۆی بەندەی بەندەکان بێت. وتی: پیرۆز بێت یەهوا خوای سام و کەنعان بەندەی ئەو بێت. خوا پەرە بەیافس بدات و لەخێوەتەکانی سام نیشتەجێ بێت و کەنعان بەندەی ئەو بێت ((عهد عتیق، سەفەری دەرکەوتن، بابی نۆیەم، ئایەی ١٩-٢٩)

### (( مناڵەکانی سام ))

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هاوسەری سام کوڕی نوح لەپشتی ((سکی)) کچی تەباویل کوڕی مەحویل کوڕی حانوخ کوڕی قین کوڕی ئادەم بوو. ئەم ژنە چەند مناڵێکی بۆ سام هێنایە دونیا: ئەرفەخشەز، ئەسوەد، لاود و ئەرەم. نازانم ئەرەم لەدایکی ئەرفەخشەز و براکانی بوو یانە. مناڵەکانی لاود کوڕی سام ئەمانە بوون: زاڵمانی شام کەپێیان

دەوتن کەنعانییەکان، فیرعەونەکانی میسرو خەڵکی بەحرەین و عوممان کەپێیان دەوترا جاشم. هەروەها لەوان بوون: کوڕانی ئەمیم کوڕی لاود کەخەڵکی (وێبار) لەسەرزەوی (رەمل) زیخەڵان بوون و ئەم ناوچە سەرزەمینێك لەنێوان شیحر و یەمامەیە. ژمارەیان روو لەزیاد بوون کرد و بەدوای ئەوە تووڕەیی خوای گەورە ئەوانی گرتەوە بەهۆی ئەو گوناحە پێی گرفتار بوون. خوا ئەوانی لەناوبرد و کەمێکیان لەسەر زەوی مایەوە کەپێیان دەوترا نەسناس. تسم لەپاشماوەکانی یەمامە تا بەحرەین بوون. تسم، عەملاقان، ئەمیم و جاشم هەموویان خەڵکی عەرەب نەژاد و عەرەب زمان بوون. عەبیل لەسەرزەوینی یەسرب هات و ئەمە پێش ئەوە بوو شارێك بەم ناوە لەم سەرزەویندا دروست بکرێت. عەملاقان پەیوەستی صەنعا بوو و ئەمە پێش ئەوە بوو بەصەنعا ناوی ببەن. دەستەیەکیان بۆ زەمینی یەسرب کۆچیان کرد و عەبیلیان لێدەرکرد و لەشوێنی جۆحفە مانەوە. لافاوێکی ماڵوێرانکەر هات و ئەوانی بۆ ((ئیجتحاف)) دوور خستەوە یانی لەناوی بردن و هەربۆیە ئەوەێ پێی دەوترێت جۆحفە.

دەڵێت: ئەرەم کوڕی سام، عەوەز و غاسر و حەویلی هێنایە دنیا. عەوەز، غاسر و عاد و عەبیلی بوو. غاسر کوڕی ئەرەم و سەمود((ثمود)) و جەدیسی هێنایە دونیا. ئەمانە عەرەب نەژاد بوون و بەزمانی میسری (عەرەبی) قسەیان دەکرد. عەرەبەکان بە(جوهۆم)) و بەم نەتەوانە (عەرەبی رەسنیان) دەوت چوونکە ئەمانە بەزمانی ئەم نەتەوانە قسەیان دەکرد وئەمە لەکاتێکدا بوو هاتنە ناویان ولای ئەوان نیشتەجێ بوون. عادییەکان لەم زیخەڵانە تا (حضرموت) نیشتەجێ بوون و سەمودییەکان لەحیجر لەنێوان حیجاز و شام تا وادی القرا. جەدیس پەیوەستی تسم بوو و لەگەڵ ئەوان لەیەمامە تا بەحرەین نیشتەجێ بوون. لەوکاتەدا بەیەمامەیان دەوت((جوو)). جاشم لەعەممان‌دا مایەوە. نبتیەکان لەمناڵەکان نبیت کوڕی ماش کوڕی ئەرەم کوڕی سام بوون و ئێرانییەکان لەمناڵەکانی فارس کوڕی تیرش کوڕی ماسو کوڕی سام.

دەڵێت: بۆ ئەرفەخشەز کوڕی سام قنیانی کوری چاوی بەدنیا هەڵهێنا کە جادووگەر بوو. بۆ قنیان، شالخ کوڕی ئەرفەخشەز هاتە دنیا. لەگەڵ لەبیرکردنی بەسەرهاتی

قنیان چوونکە جادووگەر بوو. غابر بۆ شالخ هاتە دنیا و فالغ بۆ غابر. فالغ بەمانای (قاسم) (بەخشەندە و بلاوکەرەوە)یە و ئەمە لەبەر ئەوەیە زەمین لەرۆژگاری ئەو لەنێوان رەگەزە جۆراوجۆرەکاندا دابەش کرا و کانەکان توشی پەرێشانی بوون. بۆ غابر کورەکەی قەحتان لەدایك بوو. بۆ قەحتان دوو کوڕ بەناوی یەعرەب و یەقزان لەدایك بوون و ئەم دووانە لەیەمەندا مانەوە. یەعرەب یەکەم کەس بوو لەیەمەندا مایەوە و یەکەم کەس بوو لەگەڵ (البیت العن) درودیان بۆ نارد وت. بۆ فالغ کوڕی غابر، ئەرغو لەدایك بوو و بۆ ئەرغو، ساروغ و بۆ ساروغ ناخور و بۆ ناخور تارخ لەدایك بوو کەناوی بەعەرەبی ئازەرە و بۆ ئازەر ئیبراهیم لەدایك بوو و بۆ ئەرفەخشەز نەمروود لەدایك بوو. نەمروود کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نوحە.

هوشام کەلبی دەڵێت: سند و هند لەمناڵەکانی توفیر کوڕی یەقتن کوڕی غابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشەز کوڕی سام کوڕی نوحن. جورهەم لەمناڵەکانی یەقتن کوڕی عابرە و حضرموت کوری یەقتن. یەقتن هەمان یەقتانە لەسەر بنەمای گێڕانەوی کەسێك کەرەچەڵەکی ئەو بۆ ئیسماعیل دەگەڕێنێتەوە. بەربەرەکان لەمناڵەکانی سەمیلا کوڕی مارب کوڕی فاران کوڕی عەمرو کوڕی عەملیق کوڕی لاود کوڕی سام کوڕی نوحن جگە لەدوو هۆزی صەنهاجە و کوتامە. ئەم دووانە لەمناڵەکانی فریقش کوڕی سەیفی کوڕی سەبان.

بەلاَم یافس، ئەمانە مناڵەکانی ئەون: جامر، موعع، مورك، بووان، فوبا، ماشج و تیرش. بەوتەی دەستەیەك، پاشاکانی ئێران لەمناڵەکانی جامرن. تورکان و خەزەران لەمناڵەکانی تیرش، سەقەلبیان (ئوسلاوەکان) و بوورجان لەمناڵەکانی بووان، ئەشبان لەمناڵەکانی ماشج و یاجوج و ماجوج لەمناڵەکانی موعع ن. ئەشبان لەرۆژگاری باستان لەسەرزەمینی رۆم بوون و ئەمە پێش ئەوە بوو دانیشتووانەکانی یانی مناڵەکانی عەیس کوڕی ئیسحاق و کەسانیتر لەوێ نیشتەجێ ببن. هەرکام لەم سێ دەستەیە سام و حام و یافس بەرەو سەرزەمینێك رۆشتن و لەوێ نیشتەجێ بوون و کەسانیتریان لەوێ دەرکرد. رۆمیەکان لەمناڵەکانی یافسن و وئەمانە مناڵی لفتی کوڕی یونان کوڕی یافس کوڕی نوحن.

بەڵام حام، ئەمانەی هێنایە دونیا: کوش، مسرایەم، فوت و کەنعان. لەمناڵەکانی کوش، یەکێك نمرود کوڕی کوشە کەدەستەیەك دەڵێن لەمناڵەکانی سامە. مناڵەکانیتری حام رویان کردە فەراغەکانی نۆبە، زەنج و حەبەشە. دەوترێت: مسرایەم لەمناڵەکانی قبت و بەربەر بوو.

وتراوە فوت بۆ هند و سند رۆشتووە و لەوێ ماوەتەوە و خەڵکی ئەوێ لەمناڵەکانی ئەون.

بەڵام کەنعانییەکان، دەستەیەکیان رویان کردە شام و دواتر مناڵەکانی ئیسرائیل دەرکەوتن و ئەوانیان لەوێ کوشتار کرد و شام تایبەت بوو بەمناڵەکانی ئیسرائیل. ئەوسا رۆمیەکان هێرشیان کردە سەر مناڵەکانی ئیسرائیل و ئەوانیان لەشامەوە بۆ عێراق دەرکرد جگە ل کەمێکیان کەلەوێ مانەوە. عەرەبەکان هاتن و بەسەر شامدا زاڵ بوون. بەعادییەکان (عادی ئەرەم) دەوترا و ئەمان لەناوچوون و بە سەمودییەکان (سەمودی ئێرەم) دەوترا.

دەڵێت: شوێنکەوتەکانی تەورات دەڵێن ئەرفەخشەز بۆ سام لەدایك بوو لەکاتێکدا ١٠٢ ساڵ لەژیانی تێدەپەڕی. تەمەنی سام ٦٠٠ ساڵ بوو.

بۆ ئەرفەخشەز، قینان لەدایك بوو لەکاتێکدا سی و پێنج ساڵ لەژیانی تێدەپەڕی. تەمەنی ٤٣٨ ساڵ بوو. بۆ قینان شالخ لەدایك بوو لەکاتێکدا سی و نۆ ساڵ لەژیانی تێدەپەڕی. لەکتێبەکاندا ئاماژەیان بەتەمەنی قنیان نەدا لەبەر ئەوەی جادوگەر بوو. بۆ شالخ، غابر و براکەی فەحتان لەدایك بوون و لەم کاتەدا تەمەنی سی ساڵ بوو. هەموو ژیانی ٤٣٣ ساڵ درێژەی کێشا. لەسی ساڵی فالغ، ئەرغوی هێنایە دونیا. ساڵەکانی ژیانی ٢٣٩ ساڵ درێژەی کێشا. لەسی و دوو ساڵی ئەرغو، ساروغی هاتە دنیا و هەموو ژیانی ٢٣٩ ساڵ درێژەی کێشا. بۆ ساروغ، ناخور چاوی بەدنیا هەڵهێنا دوای تێپەرینی سی ساڵ لەتەمەنی و هەموو ساڵەکانی ٢٣٠ ساڵ بوو. لە بیست و حەوت ساڵی ناخور، تارخ باوکی ئیبراهیمی هێنایە دونیا و هەموو تەمەنی ٢٤٨ ساڵی خایاند. ئیبراهیم بۆ تارخ هاتە دونیا کەهەمان ئازەرە. لەنێوان تۆفان و لەدایك بوونی

ئیبراهیم ١٢٦٣ ساڵ و ٣٣٣٧ ساڵ دوای لەدایك بوونی ئادەم بوو. بۆ قەحتان كوڕی غابر، یەعرەب و بۆ یەعرەب یەشجب و بۆ یەشجب سەبا، بۆ سەبا حەمیر و كەهلان و عەمرۆ و ئەشعەر و ئەنمار و مەر، بۆ عەمرۆ كوڕی سەبا عودەی و بۆ عودەی لەخم و جوزام لەدایك بوون.

## پاشایەتی فەرەیدون

فەرەیدون کوڕی ئەسفیان (ئاتبین) لەمناڵەکانی جەمشید بوو. دەستەیەك لەرەگەزناسانی ئێران دەڵێن: نوح هەمان فەرەیدونە کەئاژی دەهاکی سەرکوت کرد و پاشایەتی لێسەندەوە. دەستەیەکیتر گومانیان کردووە فەرەیدون هەمان (دوشاخ) (ذوالقرنین) هاوڕێی ئیبراهیمە کەخوا لەکتێبە پیرۆزەکەیدا ئاماژەی پێداوە. لێرەدا بۆیە ئاماژەم پێدا داستانەکەی لەگەڵ سێ کوڕەکەی هاوشێوەی داستانەکەی نوحە. ئێستا ئاماژە بەداستانەکەی ئەو دەدەین و هەروەها لەبەر کردەوە چاکەکانی ئەو و لەناوبردنی ئاژی دهاك لەسەر دەستی ئەو (بەهەمان شێوە کەدەڵێن لەناوچوونی ئاژی دهاك لەسەر دەستی نوح بووە))ئاماژەی پێدەدەین.

رەگەزناسە ئێرانییەکانیتر، ڕەچەڵەکی فەرەیدون دەگەیێنەوە جەمشیدی پاشا. نێوان فەرەیدون تا جەمشید دە باوکە کەهەموویان لەترسی زیانی ئاژی دهاك بە(ئەسفیان) (ئەسفیان) (ئاتبین) ناودەبران. ئەمانە بەو نازناوانەی لەخۆیان دەنا لەیەکتر دەناسرانەوە وەك (ئەسفیان خواوەندی گا سوورەکان) یا ((ئەسفیان خوای وشترە سپیەکان و رەشەکان)وهاوشێوەی ئەمانە. فەرەیدون یەکەم کەس بوو فیلی دەستەمۆ کرد و سواری بوو، باز و کۆتری پەروەردە کرد، تریاکی دروست کرد، سامانە دەست بەسەرداگیراوەکانی بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە و ئەو زەوییانە ئاژی دەهاك بەزۆر لەخەڵکی داگیر کردبوو، گەڕاندوە بۆ خاوەنەکانی و ئەوەی خاوەنی نەبوو، لەسەر هەژاراندا دابەشی کرد.

دەڵێن: یەکەمە کەس بوو(پەشمینە پۆش) سۆق ناوبرا و یەکەم کەس بوو زانستی پزیشکی خوێند. سێ کوری هەبوو بەناوی: شەرم توج و ئیرەج (لە گەورە بۆ بچوك) (سەلەم/ توور، ئیرەج). و ترسا دوای خۆی کوڕەکانی بکەونە گیانی یەك و لەبەر ئەمە ولاتەکەی بۆ سێ هەرێم دابەش کرد و ناوی هەر هەرێمێکی لەسەر تیریك نوسی و خستیە ناو تیردان و فەرمانیدا هەرکام یەکێك لەتیرەکان هەڵگرن.

بەم شێوەیان کرد و ڕۆم و عەرەبستان بە شەرم (سەلەم) بڕا، تورکستان و چین بۆ توج(توور) و عێراق و سند و هند و حیجاز... بۆ ئیرەج کەوردترینیان بوو. فەرمیدون مرد و دوای ئەو لەناو کورەکانی دوژمنایەتی رویدا و کورەزاکانیشی لەسەر دەسەلأت کەوتنە گیانی یەك. ڕژدی و دوژمنی لەناو ئەواندا گەشەی دەکرد و گەورە دەبوو تا ئەوەی توج و شەرم(توور و سەلەم))هێرشیان کردە سەر برا بچوکەکیان ئیرەج و ئەویان لەگەڵ دوو کورەکەیدا بەناشیرینترین شێوە کوشت و بەشێوەی هاوبەش بۆ ٣٠٠ ساڵ فەرمانرەوایەتی جیهانیان کرد. فەرمیدون بەردەوام بەدوای پاشماوەکانی بنەماڵەی نمروود و نەبت و کەسانیتر بوو تا هەموو گەورەکانی ئەوانی لەناو برد و ئالأکانیانی داگرت. ڕۆژگاری پاشایەتی ئەو ٥٠٠ ساڵ درێژەی کێشا.

## ڕووداوەکانی نێوان نوح و ئیبراهیم

ئێمە بەسەرهاتی نوح و مناڵەکانیمان ئاماژە پێدا و وتمان ئەوان دوای ئەو، زەمینیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد و هەرکام بەشێکیان هەلگرت. هەروەها ئاماژەمان بەپاشماوەکانی هەرکامیاندا. لەنێوان ئەواندا کەسانێك بوون زوڵم و ستەمیان کردە پیشە و خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن کە بەدرۆزن بانگیان کرد و خوا ئەوانی بۆ ئەم کارەیان لەناو برد. ئەمانە دو دەستە لەمناڵەکانی ئیرەم کوڕی سام کوڕی نوح بوون. یەکیان عاد و ئەویتریان سەموود.

عاد، هەمان عاد کوڕی عەوەز کوڕی ئیرەم کوڕی سام کوڕی نوح بوو کە بەیەکەم عاد ناویان بردووە. شوێنی مانەوەی ئەوان لەنێوان شێحر و عەممان و حضرموت لە(ئێحقاف)(درێژ ڕێگاکانی زیخەلأن)بوو. خەڵکانێك بوون یاخی و ستەمکار و بالأبەرز کەهاوشێوەیان نەبینراوە. خوای گەورە دەفەرمێت: بیربێننەوە کاتێك خوا ئێوەی دوای نوح کردە جێنشینانی زەوی و پەرەپێدانێك لە ئافراندنی - لە بالأ - بەئێوەی بەخشی (اعراف/٧/٦٩). خواوەند هود کوڕی عەبدوالله کوڕی ڕەباح کوڕی جلود کوڕی عاد کوڕی عەوەزی وەك پێغەمبەر بۆ ڕەوانە کردن. دەستەیەك لەخەڵك

گومان دەکەن هود هەمان غابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشەز کوڕی سام کوڕی نوحە. ئەمانە سێ بتەکەیان دەپەرستی: زەرا، زەموور، هوبا. ئەم پێغەمبەرە ئەوانی بۆ خواپەرەستی و وازهێنان لەخواکانیتر جگە لەخوای تاقانە بانگێشت و داوای لێکردن واز لەستەمکاری بێنن. ئەوان بەدرۆزن ناویان برد و وتیان: کێ لەئێمە پڕهێزتر دەبێت؟ جگە لەدەستەیەکی کەمیان شوێن هود نەکەوتن. داستانەکەیان بەم شێوە بوو کەکوڕی ئیسحاق دەیگێڕێتەوە. دەڵێت: خەڵکی عاد توشی وشکەساڵی بەردەوام بوون و ئەمە لەبەر ئەوە بوو هودیان بەدرۆزن ناوبرد. کاتێك کەمی و وشکەساڵی هێرشی کردە سەریان، وتیان: دەستەیەك بۆ مەککە بنێرن تا داوای بارانتان بۆ بکەن. قەبیل کوڕی عیر، لوقەیم کوڕی هەزال، مەرسەد کوڕی سەعد( کەخوا پەرەست بوو و خواپەرەستی خۆی دەشاردەوە))، جۆلهومەت کوڕی خەیبەری خاڵۆی معاویە کوڕی بەکر و لوقمان کوڕی عاد کوڕی بەهمان کوڕی عادی گەورەتریان هاورێ لەگەڵ حەفتا کەس بۆ مەککە نارد. کاتێك گەشتنە مەککە، لەدەرەوەی شار، دەرەوەی حەرەم، لای معاویە کوڕی بەکەر دابەزین. ئەو ڕێزی زۆری لێگرتن چوونکە زاوا و خاڵۆکانی ئەوان بوون. لەقیم کوڕی هەزال لەگەڵ هەزیلە کچی بەکر، خوشکی معاویە، پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەستبوو و ئەم ژنە چەندین منالی بۆ هێنلابوویە دنیا کە لەمەککە لای خاڵۆیان دەژیان. منالەکان ئەمانە بوون: عوبەید، عەمرۆ، عامر، عەمیر و هەموویان کوری لەقیم بوون.

ئەمانە عادیانی دووەم بوون کە لەدوای عادیانی یەکەم مابوونەوە. ئەو میوانانە لای معاویە دابەزین و یەك مانگ لای ئەو مانەوە و خواردیانەوە. دوو کەنیزی گۆرانیبێژ، گۆرانی بۆ دەخوێندن. کەنیزەکان کەنیزی معاویە بوون. کاتێك معاویە بینی مانەوەیان زۆری خایاند و مەبەستەکەی خۆیان لەبیر کردووە، هەڵس و کەوتی ئەوانی بەناپەسەند زانی و وتی: خاڵۆکانی من لەناوچوون. شەرمی دەکرد دەستەی نوێنەران بۆ کارێك بنێرێتە دەرەوە تا بڕۆن بە دوای مەبەستەکەیان. رازی دڵی خۆی لەگەڵ دوو کەنیزەکەی باس کرد و وتیان: هۆنراوەیەك بهۆنەرەوە و شاعیرەکەی نەزانراو بێت و ئێمە بە گۆرانی بۆیان دەخوێنین رەنگە لەشوێنەکەی خۆیان

بجووڵێن: معاویە وتی:

| | |
|---|---|
| الا یا قیل و یحک قم فهینم | لعل اللة یصبحنا غماما |
| فیسقي ارض عاد ان عادا | قد امسو لا یبینون الکلاما |

واتاکەی: ئەی قیل، هاوار لەتۆ، هەستە و پاڕانەوە دەست پێبکە ئەگەری هەیە خوا هەورێکی باران زا بۆ ئێمە بنێرێت و سەرزەوی عاد تێراو بکات چوونکە عادییەکان وایان لێهاتوە زمان بۆ قسە کردن ناکەنەوە (یا ناتوانن بیکەنەوە).

لەم دو دێرەدا (هینمە) بەمانای وتەی ئارام (پاڕانەوەیە). کاتێك دوو کەنیزەکە ئەو گۆرانییەیان خوێند و میوانەکان بیستیان، بە یەکتریان وت: ئەی خەڵکینە، کەس و کارتان ئێوەیان ناردووە لەبەرابەر ئەو زیانەی بۆیان دابەزیوە، داوای هاوکارییان بۆ بکەن بەڵام ئێوە کاری ئەوانتان پشت گوێ خست و ئەنجامدانیتان بەدواداخست. هەستن و روبکەنە بارەگای خوا و بۆ خەڵکی خۆتان داوای باران بکەن. مورسەد کوڕی سەعد وتی: سوێند بەخوا بەو پارانەوەیە کەسانی وەك ئێوە باران نابینن. ئێوە دەبێت لایەنگیری لەپێغەمبەرەکەتان بکەن تا باران بۆ ئێوە ببارێنێت و بێ گومان دەبارێت. لەم کاتەدا خواپەرستی خۆی ئاشکرا کرد. جۆلهەمە کوڕی خەیبەری خاڵۆی معاویە کوڕی بەکر پێی وت: مورسەد کوڕی سەعد لە ئێمە دوور بخەرەوە و بیخەرە زیندان.

ئەمان هاتن بۆ مەککە تا لەوێ داوای باران بۆ عاد بکەن. خوایان بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان بانگێشت کرد و داوای بارانیان کرد. خوا سێ دەستە هەوری سپی و سوور و رەشی نارد و جارچیەك جاریدا: ئەی قیل، بۆ خۆت و بۆ خەڵکەکەت هەڵبژێرە. وتی: هەوری رەش هەڵدەبژێرم چوونکە بارانی زۆرترە. جارچی جارێکیتر بانگیدایەوە: تۆ هەڵتبژارد خۆلەمێشێکی وێرانکەر، کە لەعاد هیچ کەس بەزیندووی ناهێڵێتەوە بەڵکو هەموویان لەناو دەبات، ئەکوڕێك دەهێڵێتەوە ئەباوکێك مەگەر ئەوەی بەتەواوی ژێر و ڕوویان بکات، جگە لەکورەکانی لوزییە. مناڵەکانی لوزییە هەمان

منالەکانی لەقیم کوڕی هەزال بوون کە لەمەککە لای خاڵۆیان معاویە کوڕی بەکر دەژیان. خوا هەوری ڕەشی لەگەڵ ئەو ئەشکەنجەی لەناویدا بوو، بەسەر عاد دا دابەزاند. هەور لەدۆڵێك کە(مەغیس)ی (مەغیس: شوێنی بارین) پێدەوترا، سەری دەرهێنا و عادییەکان بەبینینی شادمان بوون و دڵیان پێ خۆش کرد و وتیان: ئەمە ئەو هەورەیە باران دەبارێنێت. خوای گەورە دەفەرمێت: بەڵکو ئەوەیە بۆ هاتنی پەلەتان بوو - باییێکە ئەشکەنجەیەکی بەئازاری لەگەڵدایە و هەموو شتێك بەفەرمانی خواکەی لەناو دەبات (احقاف/٤٦/٢٤——٢٥). یانی هەر شتێك فەرمانی پێدرابێت لەناو دەبات.

یەکەم کەس ئەو هەورە زیاندەرەی بینی و وێرانکەری ئەوی هەڵسەنگاند ژنێك لەعاد بەناوی (فەهدد)بوو. کاتێك بارە قوورسەکەی بینی، قیژاندی و لەهۆش چوو. کاتێك هاتە هۆش، وتیان : چیت بینیوە؟ وتی: هەورێکم بینی تیایدا ئەستێرەکان ئاگراوی بوون و چەند پیاوێك لەپێشەوە رایاندەکێشا. کاتێك با لە دۆڵەکە هاتەدەر، حەوت دەستە کە یەکێکیان پیاوێك بەناوی (خەلەجان) بوو وتیان: با بڕۆینە لێواری دۆڵەکە و بیگەرێنینەوە. لەم کاتەدا با بەسەریاندا هەڵی کرد بەو شێوەی لە ژێر قاچەوە لێی دەدان و هەڵیدەگرتن و دواتر فڕیدەدانە خوار و ملیان دەشکا. خەلەجان بە تەنیا مایەوە و لەبەر ئەمە روی کردە کوێستان و وتی:

لم يبق الا الخلجان نفسة          يا لک من يوم دهاني امسة

بثابت الوط شديد وطسة          لو لم يجئنى جئتة اجسة

واتاکەی: جگە لەخەلەجان کەس نەماوەتەوە. هاوار لەم ڕۆژە - و چەندە زۆرن ئەم ڕۆژانە - کە دوێنێکە منی گرت و خستمی. بەهەنگاوە بەهێزەکان کەخستنی دژوار بێت. ئەگەر خۆی نەیێتە لای من، دەڕۆمە لای وگەڕان بۆ چەندایەتی و چۆنایەتیەکەی دەکەم.

هود پێی وت: باوەر بە تاقانەیی خوا بکە تا زیندو وراست بمێنیتەوە.

وتی: چ پاداشتێکم پێدەبڕێت؟ وتی: بەهەشت. وتی: ئەمانە کەلەناو هەورەکەدان وهاوشێوەی وشتڕن کێن؟ وتی: فریشتەکانن. وتی: ئەگەر باوەڕ بەخواکەت بێنم پەنام دەدات؟ وتی: ئایا بینیوتە پاشایەك کەسێك لەدەست سوپاکەی رزگار بکات. وتی: ئەگەر وایشی دەکرد رازی نەدەبووم.

ئەوسا با هەڵیکرد و ئەوی گەیاندە هاوەلآنی. خوا لەبارەی ئەوان دەفەرمێت: بەلآم عادییەکان، بەبایەکی سەرسەخت و شۆخ و نافەرمان لەناوچوون کەخوا بۆ ماوەی حەوت شەو ورۆژ بەسەریاندا هەڵیکرد. بەو رۆژە شومانەی لەخان و مانی ئەوان هیچی نەهێشتەوە. تۆ ئەو خەڵکە لەو ئەشکەنجەدا بەو شێوە دەبینی کە هەموویان کەوتوو و ڕوخاون. دەڵێی داری خورمان کە لەریشەوە دەرهاتبێتن. (حاقە/٦٩/٦—٨).

وشەی (حسوم)کە لەئایەی حەوتی ئەم سوورەدا هاتوە، بە مانای پایەدارە. یانی بایەکی پایەدارمان بەسەردا هەڵکردن و ئەوانمان لەناوبرد. ئەو بایە هیچ کەسێکی لەعاد هەڵنەگرت مەگەر ئەوەی فەرمانی لەناوچوونی پێدرابوو. هود و شوێنکەوتوانی پەنایان بردە بێستانێك و لەو بایە جگە لەنەرم بوونەوەی پێستیان زیانیان پێ نەگەشت. ئەوبایە بەهەمان شێوە لەنێوان ئاسمان و زەوی دەسووڕا و بەردی بەسەردا دەباراندن و وردی دەکردن. دەستەی نوێنەرانی عاد بۆ لای معاویە کوڕی بەکەر گەڕانەوە و لەماڵەکەی ئەودا دابەزین. لەم کاتەدا پیاوێکی وشتر سوار بەرەولای ئەوان غاریدەدا و لە لەناوچوونی عاد و تەندروستی هود ئاگاداری کردنەوە.

دەڵێن: بەلوقمان کوڕی عاد وتراوە داوای شتێك بۆ خۆت بکە و هەڵبژێرە بەلآم بزانە رێگەیەك بۆ هەمیشەیی نییە. وتی: خوایە ژیانێکی درێژم پێببەخشە. پێی وترا: ئەندازەکەیمان پێ بڵێ. وتی: بە درێژایی ژیانی حەوت لاشخۆر. ئەو جوجکی لاشخۆری لەکاتی دەرهاتن لەهێلکە هەڵدەگرت و کاتێك دەمرد، دەرۆشتە سەر هێلکەی لاشخۆرێکیتر. هەر لاشخۆر ٨٠ ساڵ دەژیا. کاتێك حەوتەمین مرد لوقمان لەگەڵیدا

مرد (کەواتە ژیانی ئەو ٥٦٠ ساڵ بوو). حەوتەمین لاشخۆر بە(لۆبەد) ناودەبرا و ژیانی هود ١٥٠ ساڵ بوو. ئارامگاکەی لەحضرموت وبەپێی وتەی دەستەیەك کەس لەمەککەیە. کاتێك دانیشتووانی عاد هەموویان مردن، خوا چەندین باڵندەی نارد هەموو جەنازەکانیان بۆ دەریا برد. لەبەر ئەمەیە خوای گەورە فەرمووی: بەشێوەیەکیان لێهات جگە لە مانەوەیان هیچیان لێنەما(احقاف/٤٦/٢٥). پێشتر هیچ بایەك هەڵینەدەکرد مەگەر ئەوەی ئەندازەیەکی بوو جگە لەم بایە. لەبەر ئەمەیە خوا دەفەرمێت: عادییەکان بە بایەکی سەرکێش و یاخی لەناوچوون(حاقە/٦٩/٦).

بەلام سەمودییەکان، (ثمود) ئەوان منالەکانی سەموود کوڕی جاسر کوڕی ئیرەم کوڕی سام بوون و شوێنی نیشتەجێبوونیان لەحێجر لەنێوان حیجاز و شام بوو. ئەوان دوای عاد زۆربوون. ناسپاسیان کردە پیشە و دەستیان بەنافەرمانی کرد. خوا بۆ ئەوان پێغەمبەرەکەی سالحی ڕەوانە کرد کەنەژادنامەکەی بەم شێوەیە: سالح کوڕی عوبەید کوڕی ئەسف کوڕی ماشج کوڕی عوبەید کوڕی جادر کوڕی سەمود. دەستەیەك دەڵێن: ئەسف کوڕی کەماشج کوڕی ئەروم کوڕی سەمود. سالح ئەوانی بۆ تاقانەیی خوا بانگێشت کرد و داوای لێکردن تەنیا ئەو بپەرستن و بەس. وتیان: ئەی سالح، تۆ پێشتر هۆکاری هیوا و ئومێدی ئێمە بوویت و ئێمە زیاتر لەمە لەتۆ چاوەڕێ بووین. ئایا ئێمە لەپەرەستینی ئەوەی باوکانمان پەرەستویانە، پاشگەز دەکەیتەوە؟ سەبارەت بەوە پێمان دەڵێی، گومانمان هەیە، گومانێك دڵ و عەقڵ پێی ڕازی نابن (هود/١١/٦٢). خوا ژیانی ئەوانی درێژ کردبوو بەشێوەیەك یەکێك لەوان ماڵێکی لەگەڵ و خشت دروست دەکرد و ماڵەکە دەڕوخا بەلام خۆی هێشتا زیندوو بوو. کاتێك بەم شێوەیان بینی، لەکێو و بەردەکان خانوویان بۆخۆیان داتاشی. بۆ ئەم کارە کەسانێکی شارەزا و خاوەن ئەزموون بوون ((شعرا/٢٦/١٤٩). ئەوان لەژیاندا بەفراوانی هەموو شتێکیان لەبەردەستدا بوو. سالح بەردەوام ئەوانی بۆ پەرستنی خواوەند هاندەدا بەلام جگە لەژمارەیەکی کەم کەس باوەڕی نەهێنا. کاتێك لەپێشنیار کردن و ترساندن و ئاگادار کردنەوەی پێداگری کرد، پێیان وت: ئەی سالح، لەگەڵ ئێمە وەرە بۆ شوێنی جەژن گرتنمان (ئەوان ڕۆژێکی جەژنیان بوو لەگەڵ بتەکانی خۆیان

دەرۆشتنە دەر)) و نیشانەیەك نیشانی ئێمە بدە و خواكەی خۆت بانگ بكە و ئێمەیش خواكانی خۆمان بانگ دەكەین. ئەگەر خواستەكانی تۆ هاتنە دی، باوەڕ بەخواكەی تۆ دێنین وئەگەر خواستەكانی ئێمە هاتنەدی، دەبێت باوەڕ بەخواكانی ئێمە بێنیت. ساڵح وتی: رازیم. ئەوان لەگەڵ بتەكانی خۆیان رۆشتنە دەر ( ساڵح لەگەڵ ئەوان بوو) داوایان لەخواكانی خۆیان كرد خواستەكەی ساڵح بەراوەردە نەبێت. گەورەی خەڵكەكان تاشەبەردێكی نیشاندا وتی: ئەی ساڵح، لەم تاشە بەردە مێچكە وشترێكی سكپڕی دە مانگەمان بۆ بێنە دەر. ئەگەر ئەم كارە بكەیت قسەكەی تۆ بەراست دادەنێین.

ساڵح لەوان بەڵێنی بەهێزی بۆ ئەم كارە وەرگرت و هاتە لای تاشەبەرد، نوێژی كرد و خوای گەورەی بانگ كرد كە لەناكاو تاشە بەرد ئازار و ژانی سكپڕی گرت بەهەمان شێوە كەژنانی سكپڕ ژان دەیانگرێت. ئەوسا تاشە بەرد قەڵشتی برد و لەناویەوە مێچكە وشترێك بەو تایبەتمەندیانەی ئەوان داوایان كردبوو هاتەدەر. سەیریان دەكرد. ئەو مێچكە وشترە بێدرەنگ وشترێكی بەگەورەیی خۆی هێنایە دنیا. گەورەی ئەو خەڵكە باوەری پێی كرد.ناوی جەندەع كوڕی عەمرۆ بوو. هەندێ لەخەڵكیتریش باوەریان هێنا. كاتێك مێچكە وشتر لەبەردەكە هاتەدەر ساڵح پێی وتن: ئەمە ئەو وشترەیە داواتان دەكرد. ئەو یەك رۆژ رۆژی هەیە و ئێوەیش رۆژی یەك رۆژ كەنۆرەی هەر كامتان زانراوە. (شعرا/٢٦/١٥٥). كاتێك رۆژی رۆژی ئەو گەشت ئەویان بەرەڵا دەكرد، ئاوی دەخواردەوە و دواتر دەیاندۆشی و ئەم شیرە هەموو دەفرەكانی پڕدەكرد. كاتێك نۆرەی ئەوان بوو، ئەویان لەئاوەكە دوور دەكردەوە و ئەو ئاوی نەدەخواردەوە و ئەوان ئاویان بۆ بەیانی پاشەكەوت دەكرد.

خوا خستیە دڵی ساڵحەوە و وەحی پێ فەرموو: خەڵكەكەی تۆ بەم زوانە مێچكە وشترەكە سەردەبڕن و دەیكوژن. ساڵح ئەم نهێنییەی لەگەڵ خەڵكدا باس كرد و وتیان: ئەم كارە ناكەین. وتی: ئەگەر ئێوەیش ئەم كارە نەكەن لەناو ئێوەدا منداڵێك لەدایك دەبێت سەری دەبڕێت. وتیان: نیشانەكەی چییە؟ سوێند بەخوا نایدۆزینەوە مەگەر ئەوەی بیكوژین. ساڵح وتی: ئەو منداڵێكی موو سورە، چاوشین، ئەسمەر و

سوور و سپی. دەڵێت: لەو شارەدا پیرە پیاوێك و پیرێژنێکی بەرێز بوون کەیەکیان منداڵێکی بوو بەڵام لەهاوسەر گرتن بۆ کوڕەکەی خۆی دوور دەخستەوە و ئەویتریان کچێکی بوو کەهیچ هاوسەرێکی بۆپەسەند نەدەکرد. ئەم کچ و کوڕە بوونە ژن و مێرد. کاتێك ساڵح وتی: منداڵێك لەناو ئێوە وشترەکە دەکوژێت ئەوان پەرەستاریان هەڵبژارد و چەندین کەسیشیان کردە پاسەوانیان. پەرەستارەکان لەدێهاتەکاندا دەگەڕان و هەر ژنێك منداڵی دەبوو لێیان دەڕوانی تا ئاگاداری تایبەتمەندییەکانی بن. کاتێ ئەو منداڵەیان بینییەوە، ژنەکان دەستیان کرد بەقاوەقیژ و وتیان: ئەمە ئەو منداڵەیە ساڵحی پێغەمبەر(د.خ) نیشانەکانی باس کردووە. پاسەوانەکان ویستیان بیگرن بەڵام گەورەکانیان ئەوانیان لەم کارە بەدوور گرت و وتیان: ئەگەر ساڵح بیەوێت ئەم کارە بکات دەیکوژین. ئەو خراپترین منداڵ بوو. لەیەك ڕۆژ بەهەمان ئەندازە گەشەی دەکرد کەمنداڵەکانیتر لەیەك حەفتەدا. لەو شارەدا نۆ کەس بوون خراپەکاریان دەکرد و کاری چاکەیان نەدەکرد (نمل/٢٧/٤٨). ئەمانە منداڵەکانی خۆیان لەترسی ئەوەی ئەو منداڵە بیت کوشتبوو تابکوژی وشترەکە نەبێت. ئێستا پەشیمان ببوونە و هاوپەیمان و سوێندیان خواردبوو ساڵح و بنەماڵەکەی دەکوژن. وتیان: لەشار دەڕۆینە دەر تا خەڵك ببینن دەمانەوێت سەفەر بکەین. دواتر دەڕۆینە ئەو ئەشکەوتەی لەسەر ڕێگەی ساڵحە و تیایدا حەشار دەگرین. کاتێك شەوداهات و ساڵح بەرەو نوێژگەی خۆی هاتەدەر، دەیکوژین و دەگەڕێینەوە بۆ ئەشکەوت و دواتر دەگەڕێینەوە بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆمان و دەڵێین: لە ڕۆژی کوژرانی ئەو لەشاردا نەبووین. خەڵکەکەمان قسەکەمان بەڕاست دەزانن. ساڵح شەو لەگەڵ ئەواندا بەسەر نابات. ئەو ڕۆشتە شوێنی نوێژ کردنەکەی خۆی کە بەنوێژگەی ساڵح ناودەبرا. کاتێك ئەو خەڵکانە ڕۆشتنە ناو ئەشکەوتەکە، تاشە بەردێك بەسەریاندا کەوتە خوار و هەموویانی کوشت. خەڵکانێك لەوان کە لەم نهێنییە ئاگادار بوون ڕۆشتنە ناو ئەشکەوتەکە و هاوڕێکانی خۆیان بە مردوو بینییەوە. وتیان: ساڵح سەرەتا فەرمانیدا منداڵەکانیان بکوژن و دواتر خۆیشیانی کوشت.

دەڵێن: ئەم نۆ کەسە دوای سەربڕینی وشترەکە و ئاگادار کردنەوەی ساڵح لەبارەی

گەشتنی ئەشکەنجەی خوایی، بۆ کوشتنی پێغەمبەر(د.خ) هاودەست بوون. چۆنییەتی ئەوەی کە: ئەو نۆ کەسەی وشترەکەیان سەربڕی، لەنێوان خۆیاندا وتیان با سالح بکوژین. ئەگەر راستگۆ بێت، کارەکەی ئەومان خێراتر کردووە و زیانەکەی ئەومان پێشتر لەناو بردووە. ئەگەر درۆزن بێت ئەومان بۆلای وشترەکەی ناردووە. شەوانە هەڵیان کوتایە سەر سالح و بنەماڵەکەی. بەلام فریشتەکان ئەوانیان بەرد باران کرد و لەناویان بردن. هاورێکانیان هاتن و ئەوانیان بەمردووی بینییەوە و بەسالحیان وت: تۆ ئەمانەت کوشتووە. ویستیان بیکوژن بەلام کەس و کاری رێگەی ئەم کارەیان لێگرتن و وتیان: ئەو ئێوەی لەئەشکەنجەی خوایی ئاگادار کردبوویەوە. ئەگەر راستگۆ بێت تووڕەیی خوای خۆتان زیاتر مەکەن و ئەگەر درۆزن بێت دەیسپێرینە دەست ئێوە. ئەوان گەڕانەوە و لەکوشتنی ئەو خۆش بوون. بەپێی وتاری یەکەم، ئەو نۆکەسەی سوێندیان خوارد و هاوپەیمان بوون، ئەو کەسانە بوون وشترەکەیان سەربڕی بەلام وتاری دووەم راستترە. و خوا زاناترە.

بزوێنەری کوشتنی مێچکە وشتر ئەمە بوو: قەدار کوڕی سالف لەگەڵ چەند کەسێکیتر لەهاورێکانی خۆی بۆ مەیخواردنەوە دادەنیشتن بەلام ئاویان دەست نەکەوت تێکەلاو مەی بکەن چوونکە ئەو رۆژە رۆژی ئاو خواردنەوەی مێچکە وشتر بوو. لەبەر ئەمە یەکیان بۆ کوشتنی هاندا. هەروەها دەڵێن: دوو ژنی جوان لەناو سەموودییەکان دەژیان بەناوەکانی قەتام ویتریان قەبال. قەدار عاشقی قەتام بوو و مەصدەع دڵدادەی قەبال. ئەم دووانە دەرۆشتن و لەگەڵ ئەو دووانە تێکەڵ دەبوون. شەوێك ئەو دووانە بەقەدار و مەصدەعیان وت: ئێوە لەئامێزی ئێمە جێگەتان نابێتەوە مەگەر ئەوەی وشترەکە بکوژن. وتیان : ئەو کارە دەکەین. لەگەڵ هاورێکانیان هاتنەدەر و کاتێك وشتر سەرقاڵی ئاو خواردنەوە بوو، مەبەستی کوشتنیان کرد. یەکێك لەو خراپەکارانە بەوەی دیکەی وت: هەنگاو بەرە پێش و سەریبڕە. هاتە نزیك وشترەکە بەلام کارەکەی بەگران و دژوار بینی و نەیکرد. یەکیتری نارد بەلام ئەویش نەیتوانی ئەنجامی بدات. هیچ کەسێکی نەدەنارد مەگەر ئەوەی ئەنجامدانی ئەو کارەی بەلاوە دژوار بوو. قەدار کوڕی سالف خۆی رۆشتە پێش

و هێرشی کردە سەر وشتر و قولاپەی بڕییەوە. وشتر کەوتە سەر زەوی و دەستی بە هەڵبەز و دابەز کرد. کوشتنی لە ڕۆژی چوارشەممە بوو. بەزمانی ئەوان (پیاوی زۆر خراپەکار)ناو دەبرا. لەناوچوونی سەموودییەکان لەڕۆژی یەکشەممە بوو کەیەکەم ڕۆژی حەفتە لای ئەوان هەژمار دەکرێت. کاتێك وشتر کوژرا یەکێك لەوان هاتە لای ساڵح و وتی: فریای وشترەکەت کەوە چوونکە کوشتیان. ساڵح ڕۆشت و خەڵك ڕویان تێکرد و داوای لێبووردنیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، فلان کەس کوشتی، ئێمە تاوانمان نییە. وتی: بڕوانن بزانن دەتوانن مناڵی بەچکە وشترەکە بگرن، ئەگەری هەیە خوا ئێوە لەئەشکەنجە دوور بخاتەوە. دەستیان بەگەڕان کرد. کاتێك بەچکە ئاه و ناڵەی دایکی خۆی بینی بەرە کێوێکی نزم ڕۆشت کەپێی دەوترا (قارە). ڕۆشتە سەر کێوەکە و خەڵك بە دوایدا. خوا بەکێوی فەرموو بەرز ببێتەوە و کێو سەری لەئاسمان سوو بەشێوەیەك باڵندەکان نەیاندەتوانی پێی بگەن. ساڵح هاتە ناو دێ و کاتێك بەچکەکەی بینی، دەستی بە گریان کرد و فرمێسکی باراند. ئەوسا ڕویکردە ساڵح و سێ جار ناڵاندی بەشێوەیەك کەف لەدەمی هاتەدەر. ساڵح وتی: بۆ هەر هاوارێك ڕۆژێك مۆڵەتتان پێدەدرێت. سێ ڕۆژ لەماڵەکانتان بخۆن و کەڵکی لێوەربگرن و ئەمە ئاگادارییەکە درۆی تیا نییە (هود/١١/٦٥). نیشانەی ئەشکەنجە ئەوەیە لەڕۆژی یەکەم ڕەنگتان زەرد دەبێت، لەڕۆژی دووەم سوور و لەڕۆژی سێیەم ڕەش. کاتێك بەرەبەیانی ڕۆژی یەکەم گەشت، ڕوخساری خۆیان دەبینی دەتوت لەگەورە و بچوك و نێر و مێ ڕوخساری خۆیان لەزەعفەران هەڵسووە. کاتێك ڕۆژی دوەم هات ڕوخساریان سوور و لەڕۆژی سێیەم بەشێوەیەك ڕەش بوون دەتوت بەخەڵوز ڕەش کراون. ئەوسا کفنیان پۆشی ودەرمانی بۆنخۆشیان لەسەر و جەستەی خۆیان سوو. دەرمانەکەیان (صەبر) و (ئەڕ) بوو. کفنەکانیان لەنەتع (پێستی چەرمین). خۆیان خستە سەر زەمین و چاویان بەهەموو سوچ و قوژبنێکی ئاسمان و زەویدا دەسووڕاند و نەیاندەزانی ئەشکەنجە لەکام لاوە بەسەریاندا دەبارێت. کاتێك ڕۆژی چوارەم هات، هاوارێك وەك بروسکە لەئاسمان بەسەریاندا دابەزی. لەترسا دڵیان لەناو سینەیاندا شەقار شەقار بوو. (ستەمکاران بەهاوارێکی ترسناك گرفتار بوون. ئەوان لەماڵەکانیان جێگیر بوون و مردن)) (هود/١١/٦٧). خوا هەموو ئەوە

کەسانەی لەنێوان رۆژ هەڵات و رۆژناوا بوون، لەناو برد مەگەر پیاوێك كە لەبارەگای خوایی بوو و پارێزگاری لێدەكرد. دەڵێن: ئەو كێ بوو؟ وتراوە: ئەو باوكی رەغال بوو كە بەوتەی دەستەیەك بەباوكی تیرەی سەقیف دەژمێردرێت.

كاتێك پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی (تەبووك) نێردرا، بەسەر دێهاتی سەموود تێپەری و بەهاوەڵانی خۆی وت: هیچ كەس لەنێوە نەچێتە ناو دێ كە و لە ناوی ئەوێ نەخواتەوە. پێغەمبەر(د.خ) شوێنی بەرزبوونەوەی بەچكە وشتری بەرەو كێو و توولە رێگایەك كەوشتر ئاوی لێدەخواردەوە، نیشانی هاورێكانی خۆیدا.

ساڵح دوای ئەم رووداوە بەرەو شام كەوتە رێ و لەفەلەستین دابەزی و دواتر رۆشتە مەككە و لەوێدا نیشتەجێ بوو تا لە ٥٨ ساڵیدا كۆچی دوایی كرد. ئەو بیست ساڵ لەناو خەڵكەكەی خۆیدا بوو و ئەوانی بۆ خواپەرەستی هاندەدا.

شوێنەكەوتوانی تەورات گومان دەكەن عاد و هود و ساڵح و سەموود لەتوراتدا ئاماژەیان پێنەدراوە. دەڵێن: بەسەرهاتی ئەوان لەناو عەرەبەكان لەزەمانی جاهلیەت و ئیسلام هاوشێوەی ناوبانگی ئیبراهیمی خەلیلە.

دەڵێم: ئەم حاشا كردنەی تەوراتییەكان سەرسورهێنەرتر لەوە نییە كەئەوان حاشایان لەپێغەمبەری ئیبراهیم و عیسی مەسیح كرد.

## ئیبراهیم ( ع ) و پاشاكانی هاورۆژگاری ئەو لەعەجەم

ئەو ئیبراهیم كوڕی تارخ كوڕی ناخور كوڕی ساروغ كوڕی ئەرغو كوڕی فالغ كوڕی غبر كوڕی شالخ كوڕی قینان كوڕی ئەرفەخشەز كوڕی سام كوڕی نوحە. لەبارەی ئەو شوێنەی لێی لەدایك بوو و ئەو شوێنانەی لێی ژیا، بیروڕاكان جیاوازن. دەڵێن لەسەرزەمینی ئەهواز لەشاری شوش چاوی بەدنیا هەڵهێنا و دەڵێن: لەبابل لەدایك بوو. هەروەها دەڵێن لە(كوسا) هاتە دنیا. دەڵێن: لەحەران چاوی بە دنیا هەڵهێنا بەڵام باوكی لەوێ بۆ شوێنێكی دیكەی برد. زۆربەی زاناكان دەڵێن: لەدایك بوونی

ئەو لەرۆژگاری نمروود کوڕی کوشە. زاناکانی ئەهلی هەواڵ دەڵێن: نمرود، فەرمانرەوایەك لەلایەن ئاژی دهاك بوو کەدەستەیەك گومان دەکەن نوح بۆ لای ئەو وەك پێغەمبەر نێردراوە. زاناکانی رۆژگاری کۆن دەڵێن: ئەو پاشایەك بوو فەرمانی بەخۆیشی دەدا و فەرمانبرداری کەس نەبوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پانتایی پاشایەتی ئەو رۆژهەلات و رۆژئاوای گرتبوویەوە و لەبابل فەرمانرەوایی دەکرد. دەڵێت: پاشایەتی سەر زەوی بۆ زیاتر لە سێ کەس دەستەبەر نەکرا: نمرود، دو شاخ و سلێمان کوڕی داوود. دەستەیەکیتر - جگە لە کوڕی ئیسحاق- یەکیتریان بەم سێ کەسە زیاد کردووە کەهەمان بخت نصرە. ئێمە ئاماژە بەناراستی ئەم قسە دەدەین.

خوا مەبەستی ئەوەی کرد ئیبراهیم وەك بەلگەیەك بۆ ئافرینراوەکانی و وەك پێغەمبەر (د.خ) بۆ بەندەکانی بنێرێت و لەنێوان ئەو و نوحی پێغەمبەر(د.خ) جگە لەساڵح و هود هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نەهاتووە. کاتێك رۆژگاری ئیبراهیم نزیك کەوتەوە، ئەستێرەناسان هاتنە لای نەمرود و پێیان وت: دەبینین لەم وڵاتەی تۆدا کوڕێك لەدایك دەبێت کەپێی دەڵێن ئیبراهیم . لەدینی ئێوە خۆی بەدوور دەگرێت و بتەکانتان دەشکێنێت. ئەم پێشهاتە لەفلاَن مانگ لەفلاَن ساڵ دەبێت. کاتێك ساڵێك ئەستێرەناسەکان وتبوویان دەستی پێکرد، نەمرود ژنانی سکپڕی زیندانی کرد جگە لەدایکی ئیبراهیم چوونکە لەسکپڕی ئەو ئاگادار نەبوویەوە لەبەر ئەوەی نیشانەکانی لێدەرنەکەوت. نەمرود هەموو منالەکانی ئەو ساڵەی سەربڕی. کاتێك دایکی ئیبراهیم ژان گرتی شەوانە پەنای بردە ئەشکەوتێك و ئیبراهیمی هێنایە دونیا و کاروبارەکانی رێکخست و ئەوسا دەرگای ئەشکەوتەکەی قایم کرد و گەرایەوە. دواتر ئەو هەرچەند سات سەریدەدا تا بزانێت چی بەسەردادێت. ئەو لەیەك رۆژدا بەئەندازەی یەك مانگی منالاَنیتر گەشەی دەکرد. دایك دەیبینی پەنجە گەورە خۆی دەمژێ چوونکە خوا لەوێوە رۆژی پێدەدا.

ئازەر لەدایکی ئیبراهیم لەبارەی دووگیانییەکەی پرسی و وتی: کوڕێکم بوو بەلاَم

مرد. پیاو قسەکەی ئەوەی بەراست زانی. دەستەیەك دەڵێن: داستان بەم شێوە نەبوو بەڵکو ئازەر لە لەدایك بوونی ئیبراهیم ئاگادار بوو بەڵام لەپاشای داشارد تا نەمرود لەبیری بکات. ئەوسا وتی من کوڕێکم هەیە و دامشاردوە، ئایا ئەگەر ئێستا ئاشکرای بکەم لەلایەن پاشاوە مەترسی لەسەرە؟ وتی: نە. رۆشت ئیبراهیمی هێنایە دەر. کاتێك ئیبراهیم سەیری خەڵك و ئاژەڵەکانی دەکرد — پێشتر جگە لە دایك و باوکی خۆی نەبینیبوو- لەباوك، سەبارەت بەوەی دەیدی پرسیاری دەکرد. باوك دەیوت: ئەمە وشترە، ئەمە مانگایە، ئەمە ئەوەیە و ئەوە ئەمە. ئیبراهیم بەخۆی وت: بێ گومان ئەم ئافرێنراوانە ئافرێنەرێکیان هەیە. هاتنە دەرەوەی ئەو دوای ئاوا بوونی خۆر بوو و لەبەر ئەمە سەری بەرز کردەوە و ئەستێرەی (ئەورمەزد) مشتەری بینی و وتی: ئەمە خوای منە. ئەوندەی نەخایاند مشتەری لەبەرچاو نەما و ئیبراهیم وتی: من خوایەك لەبەر چاو ون ببێت، نامەوێت. هاتنەدەرەوەی لەکۆتایی مانگ بوو و لەبەر ئەمە ئەستێرەی لەپێش مانگەوە بینی.

دەڵێن: سەرقاڵی تێفکرین بوو و هێشتا پانزە مانگ لەتەمەنی تێنەپەریبوو بەدایکی وت: من ببەدەر تا لەدەوروبەری خۆم بڕوانم. دایك لەشەودا ئەوەی بردە دەر و سەیری ئاسمانی کرد و ئەستێرەی بینی و لەبارەی ئافراندنی زەوی و ئاسمان بیری کردەوە و ئەوەی ئاماژەی پێدرا، سەبارەت بەئەستێرە هێنایە سەرزمان. ( کاتێك مانگی درەوشاوەی بینی وتی: ئەمە خوای منە و کاتێك مانگ خۆی داشارد وتی: ئەگەر خواکەم رێنوێنیم نەکات بێ گومان لەگومراکان دەبم) (انعام/٦/٧٧).

کاتێك رۆژ هات و خۆر تیشکی خۆی بلاو کردەوە، روناکی گەورەتری لەوەی پێشتر بینیبووی، بینی و وتی: ئەمە خوای منە، ئەمە گەورەترە. کەخۆر ئاوا بوو وتی: ئەی خەڵکینە لەوەی بۆ خوا شەریك دادەتاشن بێزارم (انعام/٦/٧٨). ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ لای باوکی و لەم کاتەدا خوای خۆی ناسی و لەدینی خەڵکەکەی بێزار بوو. بەڵام ئەو لەمبارەوە هیچی بەخەڵکەکەی خۆی نەوت. دایکی داستانی لەدایك بوونی ئیبراهیم و شاردنەوەی بەباوکی وت و ئەو، لەمکارە شادمان بوو.

ئازەر بتەکانی بۆ پەرستینی خەڵك دادەتاشی و بۆ فرۆشتن دەیدا بەئیبراهیم. ئیبراهیم هاواری دەکرد: کێیە کڕیاری ئەوەی نەزیانی هەیە و نە سوود؟ لەبەر ئەمە کەس بتی لێنەدەکڕی. بتەکانی دەبردە سەر روبار و سەری دەکردنە ناو ئاو و بەگاڵتە دەیوت: بخۆنەوە! ئەوەندەی ئەم کارە دووبارە کردەوە ئەم کارەی لەناو خەڵکدا بڵاو بوویەوە و ناوی پەیا کرد بەڵام ئەم هەواڵە بەنەمرود نەگەشت. کاتێك ئیبراهیم مەبەستی ئەوەی کردخەڵك بۆ وازهێنان لەبتپەرستی و پەرستنی خوای تەنیا بانگێشت بکات، باوکی بۆ خواپەرستی هاندا بەڵام باوکی رازی نەبوو. خەڵکی بۆ خواپەرستی بانگێشت کرد بەڵام وتیان: تۆ خۆت کێ دەپەرستی؟ وتی: خوای هەموو دنیا. وتیان: نەمرود؟ وتی: نەبەڵکو ئافرێنەری خۆم دەپەرستم. مەبەستەکەی ئاشکرا و نەمرود ئاگادار بوویەوە کەئیبراهیم دەیەوێت ئاتەوانی ئەو بتانەی خەڵك دەیپەرستن ئاشکرا بکات تا بەڵگەی خۆی بەسەرئەواندا بەهێز بکات. بەردەوام بۆ دەرفەتێك دەگەڕا بتەکان سووك و لاواز بکات. سەیرێکی ئەستێرەکانی کرد و وتی: من نەخۆشم، یانی زیانم پێگەشتووە. لەم وتەی مەبەستێکی بوو یانی کاتێك خەڵك قسەکەی دەبیستن لێی رابکەن. لەدڵەوە دەیویست خەڵك برۆنە دەر و بتەکان لەناو ببات. ئەوان جەژنێکیان هەبوو هەمووان بۆ بەسەر بردنی دەرۆشتنە دەر. کاتێك رۆشتنە دەر ئەم قسەی هێنایە سەرزمان (بیانوی هێنایەوە نەخۆشم و رێگا رۆشتن ناتوانم) ولەبەر ئەمە لەگەڵ ئەوان نەرۆشتە دەر و رۆی بۆلای بتەکان و وتی: سوێند بەخوا سیلاحێك دروست دەکەم بۆ ئەم بتانەی ئێوە ((انبیا/٢١ /٥٧). ئەم قسەیە زۆربەی خەڵك و ئەوانەی لەدواوە بوون بیستیان. رویکردە بتەکان. ئەوان لەتالارێکی گەورە شان بەشانی یەك لەگەورە بۆ بچوك دانرابوون. بچوکترینیان دەگەشتە دەرگای تالارەکە. بینی خەڵك لەبەرابەر خواکانی خۆیان خواردنیان داناوە و دەڵێن: خواکان تا کاتی گەڕانەوە بەتەنیا جێدێڵین تا لەم خواردنانە کەڵك وەربگرن. کاتێك ئیبراهیم خواردەمەنییەکانی لەبەردەم ئەوان بینی، هاواری کرد و وتی: بۆ هیچ ناخۆن؟ چوونکە وەڵامی نەبیست، جارێکیتر پرسییەوە: ئێوە چیتان لێدێت وا هیچ ناڵێن. بەنهێنی روی کردە خواکانی ئەوان و زیانی لێدان و ئەو سوێندەی خواردبووی، هێنایە دی (صافات/٩١،٩٢،٩٣/٣٧). بەتەورێك ئەوانی تێکشکاند

تا گەشتە گەورەترین بت و تەوردەکەی بەملیەوە هەڵواسی و بەجێی هێشتن و لەبتخانە گەڕایەوە.

کاتێك خەڵك گەڕانەوە و ئەوی بەسەر بتەکان هاتبوو بینیان، ترسان و ئەم کارەیان بەمەترسیدار بینی و وتیان: کەسێك ئەم بەڵایەی بەسەر خواکانی ئێمەدا هێناوە بێ گومان لەستەمکارانە. وتیان: لەلاوێکمان دەبیست خراپەی ئەمانەی دەوت و ناوی ئیبراهیم بوو ( انبیا/٢١/٥٩——٦٠). ویستیان بڵێن: ئەو بوو بەخراپە ناوی دەبرد و بەشتێکی قێزەونی هەژمار دەکردن. ئەم قسانەمان تەنیا لەو بیستووە و گومانمان هەیە ئەم بەڵایەی بەسەر خواکانی ئێمە هێنابێت. ئەم هەواڵە بەنەمرود و سەرانی هۆزەکەی گەشت و وتیان: ئەو لەبەرچاوی خەڵك بێنن تا شایەت بن (انبیا/٢١/٦١). یانی شایەتی هەڵس و کەوتێك بن لەگەڵ ئەودا دەیکەین یا شایەتی بۆ ئەو بدەن لەگەڵ خواکاندا چی کردووە، چوونکە پەسەندیان نەدەکرد بێ تاوان سزای کەسێك بدەن. کاتێك ئەویان هێنا و لەلای پاشا نەمرود کۆبوونەوە، وتیان: ئەی ئیبراهیم ، ئایا بەراستی تۆ بوویت ئەم کارەت لەگەڵ خواکانی ئێمەدا کرد؟ وتی: بەڵکو ئەم کارە بتە گەورەکەی ئێوە کردی. ئەگەر دەتوانن قسە بکەن لێیان بپرسن (انبیا/٢١/٦٢—— ٦٣). یانی ئەوەی بتی گەورە لەم کارە تووڕە بوو کە بەبوونی ئەو، ئەم بتە بچوکانە دەپەرەستن. لەبەر ئەمە ئەو بوو بتەکانی تێکشکاند. پشتیان کردە ئیبراهیم و لەو تۆمەتانەی خستبوویانە پاڵ ئیبراهیم پەشیمان بوونەوە و دەستیان بەراوێژ کردن کرد، وتیان: ئێمە ستەممان لەم لاوە کرد. ئەو بەهەمان شێوە دەناسین کەخۆی وتی. تێگەشتن بتەکان سوود و زیانیان نییە. لێرەدا وتیان تۆ بەباشی دەتزانی ئەمانە ناتوانن زیان بەهیچ شتێك بگەیێنن و قسە ناکەن (انبیا/٢١/٦٥). تۆ دەزانی ئەمانە ناتوانن قسە بکەن و لەبەر ئەمە بەئێمە دەڵێی کێ وای لەبتەکان کردووە — ئەوان ناتوانن زیان بەهیچ شتێك بگەینن - تا قسەکەی تۆ بەراست بزمێرین. خوای گەورە دەفەرمێت: شەرمەزار بوون (انبیا/٢١/٦٥) لەوەی بەڵگەیەکیان بەزیانی ئیبراهیم نەهێنایەوە. کاتێك وتیان بتەکان ناتوانن قسە بکەن، ئیبراهیم پێی وتن: ئایا جیاواز لەخوا شتێك دەپەرەستن سوود و زیانی نییە؟ هاوار لەئێوە و هاوار لەوەی جیاواز

لەخوا دەپەرستن. ئایا ئاوز بەکار نابەن. (انبیا/٢١/٦٧).

نەمرود بەئیبراهیمی وت: ئایا ئەو خوایەی دەیپەرستی و ئێمە هان دەدەیت بیپەرستین، بینیوتە؟ ئیبراهیم وتی: خواوەندی من ئەوەیە زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێت (بقرە/٢/٢٥٨). نەمرود وتی: منیش زیندوو دەکەمەوە و دەمرێنم. ئیبراهیم وتی: چۆن؟ وتی: دوو پیاو دەگرم کەدەبێت بکوژرێن، یەکیان دەکوژم و بەم شێوەیە دەمرێنم و یەکیان ئازاد دەکەم و بەم شێوەیە زیندوو دەکەمەوە. ئیبراهیم وتی: خوا خۆر لەرۆژهەڵاتەوە دەردەخات. ئەگەر تۆ دەتوانی لەرۆژئاواوە بیهێنە (بقرە/٢/٢٥٨). لەم کاتەدا نەمرود گێژ و نەیتوانی وەڵامی ئیبراهیم بداتەوە. نەمرود و هاورێکانی بۆ کوشتنی ئیبراهیم بڕیاریاندا و وتیان: بیسوتێنن و هاوکاری خواکانتان بکەن (انبیا/٢١/٦٨).

عەبدوالله کوڕی عومەر دەڵێت: پیاوێك لەعەرەبەکانی ئێران رێگەی سوتاندنی ئەوی خۆش کرد. پێی وترا: ئایا ئێرانییەکانیش عەرەبیان هەیە؟ وتی: بەڵێ کوردەکان عەرەبی ئەوانن. دەڵێن ناوی ئەو هیزن بوو و ئەو بۆ لەزەوی چەقی و تا رۆژی کۆتایی بەردەوام دەچەقێت.

نەمرود فەرمانیدا لەهەر جۆرە دار و چیلکە، سوتەمەنی کۆبکەنەوە. کار گەشتە ئەوەی ژنێك سوێندی خوارد ئەگەر بەمەبەستەکەی بگات، بۆ سوتاندنی ئیبراهیم دار و چیلکە کۆدەکاتەوە. کاتێك ویستیان بیخەنە ناو ئاگر، دار و چیلکەیان هێنا و ئاگریان تێبەردا. ئاگرێکی وا دایسا ئەگەر مەل بەسەریەوە هەڵدەفڕی، لەگەرمییەکەی دەبرژا. کاتێك بڕیاریاندا بیخەنە ناو ئاگر، ئاسمان و زەوی و هەموو ئافرێنراوەکان - جگە لەخەڵکان و پەریان - بەیەك ئاواز هاواریان بۆ دەرگای خواوەند برد: خوایە، لەزەوی تۆ جگە لەئیبراهیم کەسێتر نییە تا وەك تاقانە خوا بتناسێنێت. ئێستا بە ئاگر دەسوتێنرێت. فەرمانمان پێبدە هاوکاری بکەین. خوای گەورە فەرمووی: ئەگەر پەنای بۆ یەکێك لەئێوە هێنا هاوکاری بکەن و ئەگەر داوای لەمن کرد خۆم هاوکاری دەبم. کاتێك ئەویان بردە سەر بیناکە، سەری بۆ ئاسمان

بەرز کردەوە و وتی: خوایە، تۆ لەزەوی و ئاسمان تاقانەیت. بۆ من خوا بەس و ئەو باشترین پشتیوانە. کاتێك ئەویان دەبەستەوە، جبرەئیل هاوکاری خۆی پێشکەش کرد و وتی: ئەی ئیبراهیم پێویستت بە هاوکاری هەیە؟ ئیبراهیم وتی: پێویستم بە تۆ نییە. ئەویان خستە ناو ئاگر و خوا بانگی فەرمانی بەئاگردا: ئەی ئاگر سارد بە بۆ ئیبراهیم (انبیا/٢١ /٦٠). دەڵێن: ئەمە جبرەئیل بوو هاواری کرد و ئەگەر دەیوت ساردبە و بەدوایدا نەیدەوت ئاگات لەئیبراهیم بێت، ئیبراهیم لەسەختی سەرما دەمرد. لەو رۆژەدا هیچ ئاگرێك لەجیهاندا نەمایەوە مەگەر ئەوەی کوژایەوە چوونکە گومانیان دەبرد لەگەڵ ئەوانیانە. لەم کاتەدا خوا فریشتەی سێبەری ناردە لای ئیبراهیم تا ببێتە هۆکاری ئاشنایەتی و ئارامی ئەو.

نەمرود ماوەیەك مایەوە و دڵنیا بوو ئاگر ئیبراهیمی سوتاندووە. سەیری ئاگرەکەی کرد بڵێسەی دەسەند وبینی ئیبراهیم هاورێ لەگەڵ پیاوێکی وەك خۆی لەناو ئاگرەکەدا دانیشتووە. بەخەڵکەکەی وت: گومان دەکەم ئیبراهیم زیندووە یا من پەرێشان بووم. کۆشکێکم بۆ دروست بکەن تا لەسەرەوە لەئاگرەکە بڕوانم. لەسەرەوە سەیری ئاگری کرد و ئیبراهیمی وەك خۆی بینی.

بانگی ئیبراهیمی کرد: ئەی ئیبراهیم، گەورەیە خوای تۆ کە لەنێوان تۆ و ئەوەی دەیبینم جیایی دروست کردووە. ئایا دەتوانی لێی بێیتەدەر؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئایا دەترسی ئەگەر تیایدا بمێنیتەوە زیان بەتۆ بگەیەنێت؟ وتی: نە. ئیبراهیم لەئاگر هاتەدەر و کاتێك هاتە دەر، نەمرود پێی وت: ئەو پیاوەی لەگەڵ تۆ بینیم و هاوشێوەی خۆت بوو، کێ بوو؟ ئیبراهیم وتی: فریشتەی سێبەر بوو کە خواوەند ئەوەی بۆ لای من نارد تا ئارامم بکاتەوە و لەگەڵیدا ئاشنا ببم. نەمرود وتی: ئێستا قوربانییەك پێشکەش بەخوای تۆ دەکەم چوونکە کاتێك تۆ لەپەرستنی هەر شتێك و هەرکەسێك جگە لەو خۆت بەدوور گرت، شتی زۆرم لەتوانایی بێ کۆتایی ئەو بینی.

ئیبراهیم وتی: تا ئەو کاتەی کەمترین گومانت لەبارەی ئایینەکەی خۆتەوە هەبێت و

باوەرت پێی بێت ئەو هیچ قوربانییەك لەتۆ وەرناگرێت. نەمرود وتی: ئەی ئیبراهیم، ناتوانم پێگەی پاشایەتی خۆم بەجێبێڵم. لەم کاتەدا نەمرود چوار هەزار مانگای کردە قوربانی و وازی لەئیبراهیم هێنا و خوا ئیبراهیمی لەزیانی ئەو پاراست. دەستەیەك لەخەڵکی ئیبراهیم باوەڕیان هێنا چوونکە بینیان خوا چۆن ئەوەی لەو مەترسییە رزگار کرد. باوەر هێنانی ئەوان لەسێبەری ترس لەنەمرود و گەورەکان و دەرباریان ئەنجامدرا. هەروەها لوت کوڕی هاران کەبرازای ئیبراهیم بوو باوەڕی هێنا. ئەوان برایەکی سێیەمیان هەبوو کەناخور کوڕی تارخیان پێدەوت. ئەو باوکی بەتویل بوو و بەتویل باوکی لابان (لاوان، لاوون) و باوکی رەبقا (رەبکا، رەبەکا) هاوسەری ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و دایکی یەعقوب. لاوان باوکی (لیا) و (راحیل) (دوهاوسەرەکەی یەعقوب) بوو. هەروەها سارا باوەڕی هێنا. سارە کچی هارانی گەورەی مامی ئیبراهیم بوو. دەڵێن: سارا کچی پاشای حەران بوو کەهاورێ لەگەڵ ئیبراهیم باوەری بەخوا هێنا.

## کۆچ کردنی ئیبراهیم و هاورێکانی

ئیبراهیم و ئەو کەسانەی شوێن بەرنامەکانی ئیبراهیم کەوتن ، بڕیاریاندا لەخەڵکەکەی خۆیان جیاببنەوە. ئیبراهیم لەماڵ هاتەدەر. کۆچەر(لەرێگەو خوا و هاورێی ئەو بوو و باوکی ئازەر لەسەر کوفرەکەی خۆی لە حەران مرد. هەروەها ئەم کەسانە هاورێیەتیان دەکرد: لوت و هاوسەرەکەی سارە کەبۆ پەرەستنی خوای گەورە ئاسایشی دەویست. ئیبراهیم لەحەران دابەزی و تا ئەو کاتەی خوا ویستی لەوێدا مایەوە. دواتر ئەو ناوچەی بەجێهێشت و هەنگاوی نایە وەڵاتی میسر. لەم کاتەدا فیرعەونێك لەفیرعەونەکان فەرمانرەوایەتی میسری دەکرد کەناو رەچەڵکی بەم شێوە بوو: سنان کوڕی عەلوان کوڕی عوبەید کوڕی عولج کوڕی عەملاق کوڕی لاوز کوڕی کوڕی سام کوڕی نوح. دەڵێن: براکەی ئاژی دهاك ئەوی کردبووە فەرمانرەوای میسر. سارە لەجوانترین ژنانی جیهان بوو. هیچ کات و بەهیچ جۆرێك نافەرمانی ئیبراهیمی نەدەکرد. کاتێك وەسفی ئەم ژنەیان لای فیرعەون کرد، کەسی بۆ لای

ئیبراهیم نارد و پرسی ئەم ژنە کێیە لەگەڵ تۆدایە؟ وتی: خوشکمە (یانی خوشکی دینیمە) چوونکە دەترسا ئەگەر بڵێ ژنی منە، فیرعەون بیکوژێت. فیرعەون وتی: بیهێنە و بینێرە بۆ لای من. ئیبراهیم ئەم کارەی کرد. ژن خۆی رازاندەوە و ئیبراهیم ئەوەی بۆ لای فیرعەون نارد. کاتێك ژن رۆشتە ژوور ، فیرعەون دەستی بۆ کردەوە. کاتێك ئیبراهیم ژنەکەی خۆی بۆ لای فیرعەون نارد، هەستا و دەستی بەنوێژ خوێندن کرد. کاتێك فیرعەون دەستی بۆ لای ژنەکە درێژ کرد، دەستی وشك بوو. فیرعەون وتی: لەخوا بپارێرەوە تا زیان بەتۆ نەگەیەنم. سارە پاڕایەوە و فیرعەون دەستی چاك بوویەوە. دوبارە دەستی بۆ درێژ کرد بەڵام دووبارە دەستی وشك بوویەوە. فیرعەون وتی: لەخوا بپارێرەوە تا زیان بەتۆ نەگەیەنم. ژن بۆی پارایەوە و دووبارە لەو گرفتاری رزگاری بوو. بۆ سێەم جار ئەم کارەی دووبارە کردەوە و گیرۆدەی هەمان چارەنوس بوو. فیرعەون نزیکترین دەرگاوانی خۆی بانگ کرد و پێی وت: تۆ ژنت بۆ من نەهێناوە بەڵکو دێویکە. پێی ببەخشە هاجەر. دەربان ئەو کارەی کرد و سارە هاورێ لەگەڵ هاجەر بۆ لای ئیبراهیم گەرایەوە. کاتێك ئیبراهیم دەنگی هەنگاوەکانی ئەوەی بیست دەستی لەنوێژ خوێندن هەڵگرت و وتی: (چیت بەسەرت هاتووە؟) سارە وتی: خوا خراپەکاری ناحەزانی بۆ خۆیان گەڕاندەوە و کەنیزێکی بەناوی هاجەر بەئێمە بەخشی.

باوکی هورەیرە بەردەوام دەیوت: ئەو دایکی ئێوە بوو ئەی کوڕانی ماء السماء. باوکی هورەیرە لەپێغەمبەر(د.خ) دەگێرێتەوە کەفەرمووی: ئیبراهیم تەنیا سێ جار درۆی کرد. یەکێك ئەوەی وتی: نەخۆشم (صافات/٣٧/٨٩) ئەویتر ئەوەی وتی: ئەم بتانە بەدەستی بتە گەورەکە شکاون (انبیا/٢١/٦٣) دوایین ئەوەی وتی: سارە خوشکی منە.

## لەدایك بوونی ئیسماعیل و بردنی بۆ مەککە

دەڵێن: هاجەر کەنیزێکی خۆش ئەندام بوو کە هاوسەری ئیبراهیم سارە، ئەوی بەمێردەکەی بەخشی و وتی: بیکە بەژنی خۆت رەنگە خوا لەم ژنە منداڵێکت پێببەخشێت. سارە خۆی منداڵی نەبوو تا گەشتە تەمەنی پیری. لەگەڵ هاجەر جووت بوو و ئیسماعیلی هێنایە دونیا. لەبەر ئەمە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك دەستان بەسەر وڵاتی میسردا گرت بەباشی هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکەن چوونکە ئەوان پەیوەندی خزمایەتیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە. ئەمە ئیشارەیە بە لەدایك بوونی ئیسماعیل لەهاجەر.

ئیبراهیم ئەوی لەترسی فیرعەون لەمیسر بدرەو شام برد و لە(سەبع) لەسەرزەوی فەلەستین مایەوە. ئەو لە(مۆتەفیکە) دابەزی کەتا سەبع شەو و رۆژێك رێگایە. خواوەند ئەوەی بۆ پێغەمبەری هەڵبژارد. ئیبراهیم لەسەبع نوێژگە و چاڵاوێکی بۆ خۆی دیاری کردبوو و ئاوی چاڵەکە پاك و پاقژ بوو. خەڵکی سەبع ئازاریان دەدا و ئەو لەوان خۆی دوور خستەوە و لەوێ رۆشت. ئاوی چاڵەکە وشکی کرد و خەڵکی سەبع شوێنی کەوتن و خوازیاری گەڕانەوەی ئەو بوون بەڵام نەگەڕایەوە و حەوت بزنی مێی پێبەخشین و وتی: کاتێك ئەمانە بەرنە سەر چاڵاوەکە ئاو هەڵدەقوڵێت و پاك و فراوان دەبێت. لێی بخۆنەوە بەڵام هیچ ژنێك کە لەنەخۆشی مانگانەدا بێت لێی نەخواتەوە. ئەوان لەگەڵ بزنەکان رۆشتن و چوونە سەر چاڵاوەکە، ئاو هەڵقوڵا. لەئاوەکەیان دەخواردەوە تا ئەوەی ژنێك کە لەنەخۆشی مانگانەدا بوو لەئاوەکەی خواردەوە و ئاو گەڕایەوە بۆ شوێنێك کەئەمڕۆکە لەوێیە. ئیبراهیم لەنێوان رەملە و ئیلیا لەشارێك کەپێی دەوترا قەت یا قێت ، نیشتەجێ بوو.

دەڵێت: کاتێك هاجەر ئیسماعیلی بوو، سارە بەسەختی خەمبار بوو. خوا ئیسحاقی پێبەخشی و لەم کاتەدا تەمەنی سارە ٧٠ ساڵ و تەمەنی ئیبراهیم ١٢٠ ساڵ بوو. کاتێك ئیسحاق و ئیسماعیل پێکەوە گەورە بوون دەستیان بەشەڕ کرد و سارە

لەهاجەر تووڕە بوو و ئەوەی دەرکرد و دواتر گەڕاندییەوە. دووبارە ڕژدی پێبردەوە و دەریکرد و سوێندی خوارد تیکەیەك گۆشت لەجەستەی دەبڕێت بەڵام لووت و گوێچکەی لەسوێندەکەی خۆی دەرکرد تا عەیبدار نەبێت. دواتر تیکەیەك گۆشتی لەشوێنی شەرمی بڕی و لەو سەردەمەوە بوو خەتێنە کردن لەناو ژنان دەستی پێکرد. دەڵێن: ئیسماعیل منداڵ بوو و سارە لەبەر ڕژدی، هاجەری دەرکرد و ئەمە ڕاستە. سارە بە هاجەری وت: لەگەڵ مندا لەیەك شاردا مەمێنەرەوە. خواوەند وەحی بۆ ئیبراهیم نارد تا بڕواتە مەککە. لەو ڕۆژە لەوێوە هیچ ڕوەك و گیایەك نەبوو. ئیبراهیم هاجەر و ئیسماعیلی بردە مەککە و لەشوێنێك کەزەمزەمی پێدەوترا بەجێی هێشتن. کاتێك گەڕایەوە هاجەر بانگی کرد و وتی: ئەی ئیبراهیم کێ بەتۆی وت ئێمە بێنیتە ئێرە کەنەکشت و کاڵی لێیە و نەئاژەڵ و نەئاو و نە توێشو و هاودەم؟ ئیبراهیم وتی: خوا پێی فەرمووم. هاجەر وتی: ئەو بەجێمان ناهێڵێت و لەناومان نابات. کاتێك ئیبراهیم گەڕایەوە و بەجێهێشتن وتی: خواوەندا، چەند کەسێك لە بنەماڵەکەم لەسەرزەمینێکی بێ ئاو و ڕوەك لەپەنای بارەگاکەی تۆدا بەجێهێشت. خواوەندا ئەم کارەم کرد تا ئەوان نوێژ بخوێنن. لەتۆم دەوێت دەستەیەك لەخەڵکان هان بدەیت یارمەتی ئەوان بدەن و ئەوان لەمیوەکان ڕۆژییان دابین بکرێت تا سپاسی تۆ بکەن (ئیبراهیم /٣٧/١٤).

کاتێك ئیسماعیل تینو بوو، بەقاچی خۆی دەستی بەهەڵکەندنی زەوی کرد. لەم کاتەدا هاجەر کەوتەڕێ و ڕۆشتە کێوی سەفا تا بڕوانێت تا ببینێت شتێك دەبینێت یا نە. هیچی نەبینی. دووبارە گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و ڕایکرد تا گەشتە مەروە و ڕۆشتە سەری و سەری بەرز کردەوە. لەهەر چوار لای ڕوانی تا بزانێت شتێك بەرچاوی دەکەوێت یا نە بەڵام هیچی نەبینی. ئەم کارەی حەوت جار دووبارە کردەوە و لێرەوە بوو ڕاکردن لەنێوان سەفا و مەروە لەئایینی حەج بناغەی بۆ دارێژرا. ئەوسا هاتە لای ئیسماعیل و ئەو بەردەوام لەتینویەتی و بێ ئارامی بەقاچی زەوی هەڵدەکەند و لەشوێنی قاچەکانی کانییەك هەڵقوڵا بوو. ئەمە هەمان زەمزەمە. هاجەر بەدەستی خۆی زەوی بۆ ئاو هەڵکەند و هەرچەندە ئاوی دەست

دەکەوت لەناو مەشکی ئاوەکەی خۆی کۆی دەکردەوە. دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خوا لێی خۆش بێت! ئەگەر کاری بەئاوەکە نەدەبوو ئاوەکە بۆخۆی دەهاتەدەر.

هۆزی جۆرهۆم لەنزیك مەککە دەژیان. لەم کاتەدا باڵندەکان لەئاسمانی ئەوێ دەستیان بە فڕین کرد و ئاویان بینی. کاتێك دانیشتووانی جۆرهۆم باڵندەکانیان بینی لەسەر ئاسمانی ئەو شوێنە هەڵدەفڕن، وتیان: باڵندەکان بەردەوام لەشوێنێك هەڵنافڕن مەگەر ئەوەی ئاوی لێبێت. هاتنە لای هاجەر و وتیان: ئەگەر دەتەوێت دێینە لای تۆ و دەبینە هاونشینی تۆ و ئاوەکە هی تۆبێت. هاجەر رازی بوو. ئەوان لەگەڵیاندا بوون تا ئیسماعیل گەشەی کرد و گەورە بوو و هاجەر مرد. ئیسماعیل لەگەڵ ژنێك لەجۆرهۆم پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و لەو خەڵکە فێری زمانی عەرەبی بوو و منداڵەکانیشی فێری عەرەبی بوون وئەمانە عەرەبە عەرەبی فێربووەکانن .

ئیبراهیم داوای لەسارە کرد تا بڕواتە لای هاجەر. سارە رازی بوو بەڵام پەیمانی لێسەند کاتێك دەرواتە لای هاجەر لەئەسپەکەی دانەبەزێت. ئیبراهیم هات بەڵام هاجەر مردبوو. رۆشتە ماڵی ئیسماعیل و بەهاوسەرەکەی ئیسماعیلی وت مێردەکەت لەکوێیە. ژن وتی: لێرە نییە، رۆشتۆتە راو. ئیسماعیل کاری ئەوە بوو لەحەرەمەوە بەدوای نێچیر دەرۆشتە دەر و دەگەڕایەوە. ئیبراهیم وتی: ئایا توێشوتان هەیە میوانداری میوانەکەتی پێبکەیت؟ ژن وتی: هیچم نییە و کەسیشم لا نییە. ئیبراهیم وتی: کاتێك مێردەکەت گەڕایەوە سڵاوی لێبکە و پێی بڵێ بەردەم دەرگای ماڵەکەی بگۆڕێت. ئیبراهیم گەڕایەوە و ئیسماعیل بۆ ماڵ هاتەوە و بۆنی باوکی هەست پێکرد. بەهاوسەرەکەی وت: ئایا کەسێك هاتۆتە لای تۆ؟ وتی: پیرە پیاوێکی بەم شێوە هات و رۆشت (ژن ئەم قسەی وەك سوکایەتی پێکردن بەئیبراهیم وت). ئیسماعیل پرسی: چی بەتۆ وت؟ ژن وەڵامی دایەوە: پیرە پیاو وتی سڵاو لەمێردەکەت بکەو پێی بڵێ بەردەرگای ماڵەکەی بگۆڕێت. ئیسماعیل ئەو ژنە تەڵاقدا و ژنێکیتری هەڵبژارد.

ئیبراهیم تا ئەو کاتەی خواوەند مەبەستی بوو چاوەڕوانی کرد. دووبارە داوای مۆڵەتی لەسارە کرد تا بڕواتە بینینی ئیسماعیل. رازی بوو بەڵام پەیمانی لێسەند کاتێك دەڕوات لای ئیسماعیل لەئەسپ دانەبەزێت. ئیبراهیم هات تاگەشتە بەردەم ماڵی ئیسماعیل و بەژنەکەی وت: هاوسەرەکەت لەکوێیە؟ ژن وتی: رۆشتۆتە راو بەڵام هەر ئێستاکە بەخواستی خوا دەگەڕێتەوە. دابەزە، خوا لێت خۆش بێت. ئیبراهیم وتی: ئایا توێشوت هەیە میوانداری میوانی پێبکەیت؟ وتی: هەمە. ئیبراهیم وتی: لەماڵەکەت نان یا گەنم یا جۆ یا خورما هەیە؟ دەڵێت: ئەو ژنە شیر و گۆشتی هێنا و ئیبراهیم بۆ ئەم دووانە دۆعای بەخێری خوێند. ئەگەر نان یا گەنم یا جۆ یا خورمای دەهێنا زۆرترین بەشی زەوی لەمانە پڕ دەبوو. ژن وتی: دابەزە تا سەرت بۆ بشۆم. ئیبراهیم دانەبەزی. ژن بۆ ئیبراهیم بەرد یا ئاورێژێکی هێنا ( ئەمە هەمان پێگەی ئیبراهیمە) لای راستی ئیبراهیم داینا و قاچی لەسەر دانا و جێگە پێکەی لەسەری مایەوە. ژن بەشی راستی سەری ئەوی شۆرد و ئەوسا بەردەکەی بردە لای چەپی جەستەی. ئیبراهیم وتی: کاتێك مێردەکەت گەڕایەوە سڵاوی بگەینە و پێی بڵێ بەردەم ماڵەکەت بەهێز بووە.

کاتێك ئیسماعیل هاتەوە و بۆنی باوکی هەست پێکرد لەهاوسەرەکەی پرسی: ئایا کەسێك هاتۆتە لای تۆ؟ ژن وتی: بەڵێ پیرەپیاوێك لەباشترین و خۆشبۆنترین خەڵکانی زەوی کە ئەمە و ئەوەی بەمن وت، هات. سەریم بۆ شۆرد و ئەمە جێگە پێی ئەوە. ئەو سڵاوی گەیاندی و وتی: بەردەرگای ماڵەکەت بەهێزبووە. ئیسماعیل وتی: ئەو باوکم ئیبراهیم بوو.

دەڵێن: ئەوەی ناوەکەی نارد، جبرەئیل بوو کەلای هاجەر هاتە خوار و هاجەر لەناو بیاباندا رایدەکرد. هاجەر دەنگی ئەوەی بیست و وتی: دەنگی خۆتت بەمن گەیاند. ئێستا هاوکاریم بکە کەمن و هاورێکانم بەرەو لەناوچوون دەڕۆین. جبرەئیل ئەوەی بردە شوێنی زەمزەم و قاچی لەزەوی دا و کانییەك هەڵقوڵا. ژن رایکرد و مەشکەکەی لێ پڕ کرد. جبرەئیل وتی: چیتر لەتینویەتی مەترسە.

## دروست کردنی بارەگایی خوا لەمەککە

دەڵێن: دواتر خوا فەرمانی بەئیبراهیم دا بارەگای ئەمنی خوایی (البیت الحرام) دروست بکات. ئیبراهیم لەم کارە دڵتەنگ بوو و خوا ئارامی بۆنارد کەهەمان بای (خجوج)ە. بایەکە نەرم و ئارام و خۆڵ هەڵدەگرێت. ئەم بایە دوسەری هەیە. با لەگەڵ ئیبراهیم کەوتە رێ تا گەشتە شوێنیماڵەکە و لێرەدا کۆبوویەوە و سوورڕا بەهەمان شێوە کەفقەڵغانی چەرمین بێ دار دەسوورێت. ئیبراهیم فەرمانیدا لەهەمان شوێن کەبا ئارام دەبێتەوە ماڵی خوا دروست بکرێت.

دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبووە، بەڵکو خوا هەورێکی نارد کەسەرێکی هەبوو و ئەم هەورە کەوتە قسە کردن و لەگەڵ ئیبراهیم دا ئاخاوت و وتی: ئیبراهیم لەسێبەرەکەی من یا بەئەندازەی من ماڵێك دروست کە و هیچی پێ زیاد مەکە و لێی کەم مەکەرەوە. ئیبراهیم ماڵەکەی دروست کرد. ئەم دوو وتارە علی گێراویەتییەوە. سودی دەڵێت: ئەوەی بۆ شوێنی دروست کردنی ماڵەکە رێنوێیی کرد، جبرەئیل بوو.

ئیبراهیم بەرەو مەککە کەوتە رێ و کاتێك گەشتە ئەوێ، ئیسماعیلی بینی تیرێك لەپشتی زمزم راست دەکاتەوە. ئیبراهیم بە کوڕەکەی خۆی فەرموو: ئەی ئیسماعیل خوا فەرمانی بەمنداوە ماڵێکی بۆ دروست بکەم. ئیسماعیل وتی: فەرمانی خواوەند بەجێبێنە. ئیبراهیم وتی: فەرمانیشی بە تۆداوە لەدروست کردنیا هاوکاری من بکەیت. ئیسماعیل وتی: ئەم کارە دەکەم. ئیبراهیم لەگەڵ ئەو دەست بەکار بوو. ئیبراهیم ماڵەکەی دروست دەکرد و ئیسماعیل بەردی دەدایە دەست. دواتر ئیبراهیم بەئیسماعیلی وت: بەردێکم بۆ بێنە تا لەناو ستوون (روکنەکەدا)جێگەی بکەمەوە بۆ ئەوەی نیشانەیەك بۆ خەڵکان بێت. کێوی باوکی قبیس بانگی کرد و وتی: تۆ لای من ئامانەتێکت هەیە . دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نییە، بەڵکو جبرەئیل لەو بەردە رەشە(حجرە السود) ئاگاداری کردەوە و ئیبراهیم هەڵیگرت و لەشوێنەکەی خۆی دایناو. هەرچییان دروست دەکرد دەیانوت: خواوەندا لێمان وەربگرە، تۆ بیسەرێکی زانایت (بقرە/٢/١٢٧).

کاتێك بیناکە بەرز بوویەوە و پیرەپیاو لەبەرز کردنەوەی بەرد ناتەوان بوو، لەسەر بەردێك وەستا کەهەمان شوێن یا جێگای ئیبراهیمە. دووبارە کوڕەکەی بەردی دەدایە دەستی. کاتێك لەدروست کردنی ماڵەکە تەواو بوو، خوا فەرمانی پێدا لەناو خەڵك بۆ حەج کردن بانگەواز بکات. ئیبراهیم وتی: خوایە، ئاوازی من بە کوێ دەگات؟ خوا فەرمووی: تۆ بانگەواز بکە و گەیاندنەکەی بەمن بسپێرە: ئیبراهیم بانگی هەڵدا: های خەڵکینە! خوا فەرمانی بەئێوە داوە سەردانی ماڵی کۆن (بيت العتيق) بکەن. هەموو ئەو کەسانەی لە ئاسمان و زەوی بوون و هەمووی ئەوانەی لەپشتی پیاوان و منااڵانی ژناندا بوون، دەنگی ئەویان بیست. لەبەر ئەمە هەموو ئەو کەسانەی باوەڕیان هێنابوو و لەپێشەوە بەزانستی خوایان زانیبوو کەتا رۆژی کۆتایی فەرمان بەحەج کردن دەدات، وەڵامی بانگەوازەکەی ئیبراهیمیان دایەوە. لەهەر لایەکەوە وەڵامی بۆهاتەوە: بیستمان، بیستمان. ئەوسا ئیسماعیلی لەگەڵ خۆی بردە شوێنی تێراو کردن (ترويه) و ئەوی لەمنی دابەزاند و کەسانێك، لەخواپەرەستان کە لەگەڵیاندا بوون لەوێ کۆبوونەوە و لەگەڵ ئەوان نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی شەوان و نوێژی خەوتنانی خوێند و ئەوسا شەو مانەوە و نوێژی بەیانیشیان خوێند. دواتر رۆشتە عەرەفە و لەوێ مایەوە تا خۆر هەڵات و نوێژی نیوەڕۆ و نوێژەکەیتری پێکەوە خوێند. دواتر ئەوی بردە شوێنی وەستانی عەرەفە کە پێشنوێژی لێ دەوەستێت. ئەوەی بردە سەر (اراك) و کاتێك خۆر ئاوا بوو، ئەو و هاوڕێکانی نارد تا گەشتنە (مۆزدەلیفە) (شوێنی نزیك بوونەوە لەدەرگای خواوەند) و نوێژی شەوان و خەوتنانی پێکەوە خوێند و شەوی لەوێ بەسەر برد، بەرەبەیان هات، نوێژی بەیانی خوێند. ئەوسا لەسەر کێوی (قزح) قوزەح وەستا و کاتێك روناك بوویەوە، ئەو و هاوڕێکانی بردە پێش و نیشانی دان و فێری کردن چی بکەن و ئایینی حەج چۆن جێبەجێ بکەن. دواتر بەردە وردەیان کردە (جومره) و ئەوی بردە شوێنی سەربڕینی مەڕ و ئاژەڵەکانیتر (شوێنی قوربانی کردن) و قوربانی کرد و سەری شت و نیشانیدان چۆن بەدەوری ماڵی خوادا بسوڕێنەوە (تەواف چۆن ئەنجام بدات). دواتر ئەوەی گەڕاندەوە بۆ منی تا نیشانی بدات چۆن وردە بەرد بهاوێژێت و لەم کاتەدا کۆتایی بە ئایینی حەج بهێنێت.

لەپێغەمبەر(د.خ) دەگێرنەوە: جبرەئیل بوو ئایینی حەج کردنی فێری ئیبراهیم کرد. ئەم وتارە عەبدواللە کوڕی عومەر لەپێغەمبەری گێراوەتەوە. ماڵی کەعبە بەهەمان شێوە ئیبراهیم دروستی کردبوو، پایەدار بوو تا ئەوەی قورەیشیەکان لە سی و پێنج ساڵی پێغەمبەر(د.خ) وێرانیان کرد و بەخواستی خوا ئاماژەی پێ دەدەین.

## داستانی سەربڕینی منداڵەکەی خۆی لەرێگای خوا

زاناکانی کۆنی موسوڵمان لەبارەی (زەبیح) سەربڕاو لەرێگەی خوا بیروبۆچوونەکانیان جیاوازە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئیسماعیلە. دەستەیەکیتر دەڵێن ئیسحاقە. هەردو وتەکە لەپێغەمبەر(د.خ) گێردراوەتەوە. ئەگەر لەمبارەوە گێرانەوەیەکی راست و بەهێز دەبوو پشت گوێمان نەدەخست و باسی ئەویترمان نەدەکرد. بەلاَم ئەو حەدیسەی دەڵێت زەبیح ئیسحاقە، ئەوەیە ئەحنف لەعەباس کوڕی عەبدولموتەلیب لەپێغەمبەر(د.خ) دەیگێڕێتەوە سەبارەت بەم ئایەی خوای گەورە کەدەفەرمێت: ئێمە کوڕەکەی ئیبراهیممان پێفرۆشت بەشتێکی گەورە و رێزداری شیاوی سەربڕین (صافات/٣٧/١٠٧). ئەم حەدیسە لەوتاری عەباس کوڕی عەبد ولموتەلیب لەوتەی خۆیەوە هاتوە و تا پێغەمبەری نەگەیاندووە.

حەدیسێکیتر لەبارەی ئەوەی ئیسماعیل زەبیحە ئەوەیە سەنابحی ئاماژەی پێداوە. دەڵێت: لای معاویە کوڕی ئەبی سفیان بووم باسی زەبیح هاتە پێش. وتی: لەگەڵ کارزانی ئەم کارە روبەرو بوونەوە. ئێمە لای پێغەمبەر(د.خ) بووین کە پیاوێك هات و وتی: ئەی کوڕی دو زەبیح، لەوەی خوا تایبەتی کردووە بەتۆ، شتێك بەمن ببەخشە. پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی. بەمعاویە وترا: داستانی دو زەبیح چییە؟ وتی: عەبدولوتەلیب نەزری کرد ئەگەر خوا هەڵکەندنی چاڵی زمزم ئاسان بکات، یەکێك لەکوڕەکانی لەرێگای خوا قوربانی دەکات. تیری تیروپشك بەناوی عەبدواللە باوکی پێغەمبەر (د.خ) دەرهات و عەبد ولموتەلیب ئەوەی بە سەربڕینی سەد وشتر کڕیەوە. زەبیحەکەیتر ئیسماعیلە.

## ئەوانەی دەڵێن زەبیح ئیسحاقە

عومەر کوڕی خەتاب، علی، عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب و کورەکەی عەبدوالله کوڕی عەباس لەگێرانەوەیەك لەعێکرمەمە، عەبدوالله کوڕی مەسعود، کەعب، کوڕی سابت، کوڕی ئەبی هوزەیل و مەسروق لەویان گێراوەتەوە کەزەبیح بێ گومان ئیسحاق بووە.

دەگێرێتەوە عەمرۆ کوڕی ئەبی سفیان کوڕی ئەبی ئەسید کوڕی ئەبی جاریە سەقەفی کەرۆژێك کەعب بەباوکی هورەیرەی وت: دەتەوێت لەئیسحاق کوڕی ئیبراهیم داستانێکت بۆ بگێرمەوە؟ وتی: دەمەوێت. کەعب وتی: کاتێك ئیبراهیم لەخەودا بینی ئیسحاق سەردەبرێت، دێو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەم کارەدا بنەماڵەی ئیبراهیم فریو نەدەم دواتر هیچ کام لەوان ناتوانم فریو بدەم. دێو رۆشتە روخساری پیاوێك کەهەمووان دەیان ناسی. ئەو رۆشت تا ئەوکاتەی ئیبراهیم کورەکەی ئیسحاقی بۆ سەربڕین دەبردە دەر، رۆشتە لای سارە و وتی: لەم بەرەبەیانە زوودا، ئیبراهیم کورەکەی ئیسحاق بۆ کوێ دەبات؟ ژن وتی: بە دوای کارێکی خۆیان. دێو وتی: نە، سوێند بەخوا ئەو دەبات تا سەری ببڕێت. سارە وتی: ئەو کوری خۆی سەرنابڕێت. دێو وتی: سوێند بەخوا سەری دەبڕێت چوونکە گومان دەکات خوا بۆ ئەم کارە فەرمانی پێداوە. سارە وتی: باشترین کار ئەوەیە فەرمانی خواکەی خۆی جێبەجێ بکات. ئەوسا دێو هاتەدەر و رۆشتە لای ئیسحاق وپێی وت: ئیبراهیم دەیەوێت سەرت ببڕێت. ئیسحاق وتی: ئەم کارە ناکات. دێو وتی: بەڵێ سوێند بەخوا ئەو گومان دەکات خوا بۆ ئەم کارە فەرمانی پێداوە. ئیسحاق وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خوا فەرمانی پێدابێت، بێ چەند و چوون فەرمانەکەی جێبەجێ دەکات. دێو بەجێی هێشت و رۆشتە لای ئیبراهیم و وتی: لەم بەیانییەدا لەگەڵ کوڕەکەت بۆ کوێ دەرۆن؟ ئیبراهیم وتی: بەدوای کارێك. دێو وتی: نە، سوێند بەخوا دەتەوێت کوڕەکەت سەر ببڕیت. ئیبراهیم وتی: بۆ؟ دێو وتی: چوونکە گومان دەکەیت خوا بۆ

ئەم کارە فەرمانی پێداویت. ئیبراهیم وتی: ئەگەر خوا فەرمانی پێدابێتم بێ چەند و چوون جێبەجێی دەکەم.

کاتێك ئیبراهیم ئیسحاقی گرت تا سەری ببڕێت، خوا ئەوی لەم کارە بەخشی و ئەوی بەقوربانییەکی گەورەتر کڕییەوە (وبەخۆی فرۆشتەوە کەهەمووان هی ئەون). خوا خستییە دڵی ئیسحاقەوە: ئێستا دۆعایەکت پێدەبەخشم کە هەرچیت بووێت پێتی دەبەخشم. ئیسحاق وتی: خوایە، هەرکام لەبەندەکانت لەپێشینان وئەوانەی دواتر دێن ئەگەر شەریکیان بۆ تۆ دروست نەکرد بیانخەرە بەهەشتەوە.

عوبەید کوڕی عومەر دەڵێت، موسا وتی: خوایە، خەڵکان دەڵێن (ئەی خوای ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب) ئەمانە لەکوێوە گەشتونەتە ئەم پێگەیە؟ وتی: ئیبراهیم هیچ کات منی لەگەڵ شتێکیتردا بەهاوسەنگ نەبینی مەگەر ئەوەی منی هەڵبژارد. ئیسحاق ئامادەیی نیشاندا بۆ رەزامەندی من سەری ببڕدرێت و گیانی خۆی بەمن بەخشیوە، دیارە بۆ بەخشینی شتەکانیتریش ئامادە بوو. یەعقوبیش بەشێوەیەك بوو هەرچەندە گرفتارییەکانی ئەوم زیاد دەکرد گومانی چاکەی لەبارەی منەوە زیادی دەکرد.

## ئەو کەسانەی دەڵێن زەبیح ئیسماعیل بوو

دەگێڕنەوە: سەعید کوڕی جوبەیر، یوسف کوڕی مەهران، شەعبی، موجاهید و عەتا کوڕی ئەبی رەباح لەعەبدوالله کوڕی عەباس کەدەیوت: زەبیح بێ گومان ئیسماعیل بوو. جوولەکەکان گومان دەکەن زەبیح ئیسحاقە. ئەوان درۆدەکەن. باوکی تۆفەیل و شەعبی هەرکامیان دەڵێن: دو شاخی ئەو مەڕەی بووە فیدایی کوڕەکەی ئیبراهیم لەکەعبەدا بینیمان.

محمد کوڕی کەعب دەڵێت: ئەوەی خوا لەنێوان دوو کوڕەکەی ئیبراهیم فەرمانی سەربڕیندا، ئیسحاق بوو. ئێمە ئەمە لەکتێبی خوا سەبارەت بەگێڕانەوەی داستانی

ئیبراهیم و فەرماندرانی بەسەرپڕینی وکوڕەکەی دەبینین کەئەو ئیسماعیل بوو. چۆنیەتی ئەوەی خوای گەورە داستانی خەوەکەی ئیبراهیم و فەرماندرانی بەسەربڕینی یەکێك لە دوو کوڕەکەی بە کۆتایی گەیاند و فەرمووی: ئیبراهیم مان بەئیسحاق مژدە دا و دڵخۆشمان کرد کەیەکێك لەپێغەمبەرە باشەکان بوو (صافات/٣٧/١١٢). دەڵێت: ئەومان بەپێغەمبەری ئیسحاق مژدە دا. دوای ئەوە لەمنداڵان و منالأنی منالەکانی ئەوان یەعقوب تا هارون و موسا باس دەکات (صافات/٣٧/١١٢—١١٥). ئەو کەمژدەی بوون بەپێغەمبەری ئیسحاقی بەئیبراهیم دابوو، هیچ کات فەرمانی سەربڕینی نەدەدا. خواوەند تەنیا فەرمانی سەربڕینی ئیسماعیلی پێدا. ئەم بەڵگەیە محمد کوڕی کەعب بۆ عومەر کوڕی عەبدالعزیزی گێرایەوە ( و ئەو لەم کاتەدا خەلیفە بوو). عومەر وتی: ئەمە ئەو شتەیە منیش لەبارەیەوە ئەندێشەم دەکرد و داستانەکە بەو شێوە دەبینم کەتۆ ئاماژەت پێدا.

## هۆکارێك کە خوا فەرمانی سەربڕینی دا و چۆنییەتی سەربڕین

دەڵێن: خوا فەرمانی بەئیبراهیم دا کوڕەکەی سەربڕێت. ئەم وتارە لەناو گێرانەوەیەکدایە کەدەڵێت ئیبراهیم داوای لەخوا کرد کوڕێکی باش و شیاوی پێببەخشێت. وتی: خوایە کوڕێکی چاك لەباشەکانم پێ ببەخشە(صافات/ ٣٧/١٠٠). کاتێك فریشتەکان مژدەی کوڕێکی فرمزانیان پێدا وتی: ئێستا ئەوە سەربڕاوی خوایە. کاتێك کوڕەکە لەدایك بوو و گەشەی کرد و گەشتە ئەوەی بتوانێت لەگەڵ باوکی خۆی کاربکات، پێی وترا: نەزرەکەی خۆت بیربێنەرەوە. ئەمە وتاری کەسێکە گومان دەکات زەبیح ئیسحاقە. بێژەری ئەم وتارە گومان دەکات ئەم داستانە لەشام لەدوو میلی ئیلیا رویداوە. ئەو کەسەی گومان دەکات زەبیح ئیسماعیل بوو دەڵێت: ئەم داستانە لەمەککە رویداوە.

محمد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئیبراهیم فەرمانی پێدرا کوڕەکەی سەر ببڕێت، وتی: کوڕم، ئەم گوریس و کێردە بگرە و لەگەڵ من بۆ دۆڵی نێوان دو کێو وەرە تا بۆ

ماڵەوە چیلکە و چیل کۆبکەینەوە. کاتێك بەرێکەوتن، ئیبلیس لەسەر رێگای دەرکەوت تا لەم کارە پەشیمانی بکاتەوە. وتی: ئەی دوژمنی خوا، لەمن دوور کەوەرەوە. سوێند بەخوا بێ گومان بەدوای فەرمانی خوادا دەرۆم. دووبارە ئیبلیس سەرە رێگای لەئیسماعیل گرت و ئاگاداری کردەوە باوکی دەیەوێت چی لەگەڵ بکات. ئیسماعیل وتی: فەرمانبردار و گوێرایەڵی خوای خۆمم. ئیبلیس رۆشتە لای هاجەر و ئەوی ئاگادار کردەوە. هاجەر وتی: ئەگەر خوا فەرمویێتی، سەری پێ دەسپێرین. ئیبلیس بەتوورەییەوە گەرایەوە چوونکە نەیتوانی هیچ کام لەوان فریو بدات.

کاتێك ئیبراهیم لەگەڵ کورەکەی لەدۆڵی (سەبیر) بەتەنیا مایەوە، پێی وت: کورم، لەخەودا بینیم تۆ سەردەبرم، بروانە تا بزانیت لەم کارەدا چی دەبینیت. کور وتی: باوکە ئەوەی بەتۆیان فەرمانداوە، بەئەنجامی بگەینە و بەخواستی خوا لەخۆراگران دەبم. (صافات/٣٧/١٠٢). ئەوسا کور وتی: باوکە، لەبەر ئەوەی دەتەوێت سەرم ببرێت دەست و پێم بە توندی ببەستەرەوە تا خوێن بەرتۆنەکەوێت و بەهای من کەم نەبێتەوە چوونکە مەرگ دژوارە. کێردەکەی خۆێشت تیژ بکە تا ئاسوودەم بکەیت. کاتێك منت خەواند، روخسارم با لەسەر خاك بێت چوونکە دەترسم گەر سەیری روخسارم بکەیت، خۆشەویستی باوکانە داتبگرێت و لەئەنجامدانی فەرمانەکەی خوا پەشیمان ببیتەوە. هەروەها دەمەوێت ئەگەر بەباشی دەزانیت کراسەکەم بۆ هاجەری دایك ببەیت رەنگە ببێتە هۆی دڵدانەوەی ئەو. ئیبراهیم وتی: چ هاورێیەکی باشی لەجێبەجێ کردنی فەرمانی خوا، کورم!

ئیبراهیم بەهەمان شێوەی ئەو وتبووی، بەستییەوە وکێردەکەی خۆی تیژکرد وناوچاوی خستە سەرخاك (صافات/٣٧/١٠٢). ئەوسا کێردەکەی خستە سەر قورگی بەڵام خوا دەمی کێردەکەی هەڵگەڕاندەوە و پشتەکەی کەوتە سەر قورگی. ئیبراهیم ئەوەی بۆ لای خۆی راکێشا تا کارەکەی تەواو بکات. لەم کاتەدا بانگیان کرد: ئەی ئیبراهیم ئەو خەوی بینیبووت هێناتەدی. ئێمە چاکەکاران بەم شێوەیە پاداشت دەدەینەوە (صافات/٣٧/١٠٥). ئەی ئیبراهیم ئەمە قوربانی تۆ و فیدایی کورەکەی تۆیە. ئەمە سەر ببرە.

دەڵێن: خوای گەورە وەرەقەیەکی مسی خستە سەر قوورگی کوڕەکەی ئیبراهیم. عەبدوڵڵا کوڕی عەباس دەڵێت: بۆ ئەو مەڕێکیان لەبەهەشتەوە هێنا کە چل پاییز تیایدا لەوەڕا بوو. دەستەیەکیتر دەڵێن: ئەمە ئەو مەرەبوو هابیل کردبوویە قوربانی. عەلی دەڵێت: مەڕێکی شاخدار بوو ، چاوی گەورە و سپی رەنگ. حەسەن دەڵێت: بێ گومان ئەوەی بووە فیدایی ئیسماعیل، بزنە کێویەکی نێر بوو کە لەکوێستانی سەبیر بۆ ئیبراهیم دابەزی و ئیبراهیم سەریبڕی. دەستەیەك دەڵێن ئەوی بردە پێگەی ئیبراهیم و دەستەیەك دەڵێن بۆ شوێنی قوربانی کردن لەمەنی.

## ئەوەی خوا ئیبراهیمی پێ تاقی کردەوە

دوای ئەوەی خوا ئیبراهیمی بەئاگری نەمرود و فەرمانی سەربڕینی کوڕەکەی تاقی کردەوە، ئەمجارە خوا بەقسە ئەوی خستە ناو داوی تاقی کردنەوە. خوا بەم شێوە دەفەرمێت: بیر بێنەرەوە کاتێك خوا ئیبراهیمی بەچەند قسە و فەرمانێك تاقی کردەوە و ئیبراهیم ئەوانی ئەنجامدا و کەم و کوری لەخۆی نیشان نەدا (بقره/٢/١٢٤). زاناکان و رێبەرانی کۆن لەبارەی ئەم قسەوە بیروبۆچوونیان جیاوازە. عەبدوڵڵا کوڕی عەباس لەگێرانەوەی عێکریمە لەو لەبارەی ئەم ئایە دەڵێت: خوا هیچ کەسی بەم شێوە تاقی نەکردەوە کەوەك ئیبراهیم بەجوانی ئەنجامی دابێت. خوا لەبارەی ئەم تاقی کردنەوە دەفەرمێت: ئیبراهیم ئەو پێغەمبەرەیە ئەوەی فەرمانی پێدرا، سەری پێسارد (نجم/٥٣/٣٧). دەڵێت: ئەمانە دە قسەن کە لەسورەی (برائەت) بەم شێوە باسیان لێوە کراوە: (ئەوانەی رزگاری گەورەیان پێدەبڕێت ئەمانەن): شوێنکەوتوانی خوا، خواپەرەستەکان، ئەوانەی وەسفی خوا دەکەن، بەرۆژوان، نوێژکەران، ئەوانەی لەبەرابەر خوا سەر لەخاك دەسون، رێنیشاندەرانی خەڵك بۆ چاکەکاری، ئەوانەی خەڵك لەهەڵە و کاری خراپە دەگێرنەوە، راگرانی ئەندازەکانی خوا، ئەوانەی باوەریان هەیە (ئایەی ١١٢ سورەی تۆبەم). یا دە قسەن کە لەسوری ئەحزاب بەم شێوە باسیان لێوە کراوە: ئەو ژن و پیاوانەی مل دەدەنە فەرمانەکانی خوا، راست بێژان، لەخۆ بووردوان، چاکەکاران و بەخشەران، بەرۆژوان، ئەوانەی شەرمی خۆیان بەباشی

دەپارێزن، ئەوانەی زۆر بیری خوا دەکەنەوە و خوا بۆ ئەوانی ئامادە کردووە بەخشین و بەهای فراوان (ئایەی ٣٥، سورەی سی و یەك). یا دە قسەن کە لەسورەی مۆمن بەم شێوە باسیان لێوە کراوە: رزگارن ئەوانەی باوەریان هەیە، ئەوانەی لەنوێژدا رۆچوون و ئەوانەی زەکات دەدەن و ئەوانەی شەرمی خۆیان بەباشی دەپارێزن مەگەر لەبەرابەر ژن یا کەنیزەکانی خۆیان کە ئەوانە حەلاڵن بۆیان و هەر کەس زیاتر لەمەی بووێت، ئەو لەئەندازە تێپەرەکانە و ئەوانەی رێز لەئەمانەت و بەڵێنی خۆیان دەگرن و ئەوانەی لەکاتی خۆیدا نوێژ دەخوێنن (ئایەی ١—٩ ، سوری بیست و سێیەم). کەسانیتر دەڵێن ئەم دە قسە دە تایبەتمەندین.

عەبدوالله کوڕی عەباس لەبارەی گێرانەوەی تاوس و کەسانیتر لەو دەڵێت: دە قسەکە بەم شێوەن کەپێنجیان لەسەردان بەم شێوەیە: کورت کردنەوەی سمێل، غەرغەرە کردنی ئاو لەدەم لەکاتی دەست شۆرین، بۆنکردنی ئاو، سیواك کێشانی ددان، کردنەوەی قژە سەر، پێنجیان لەناو جەستەدان بەم شێوەیە: نینۆك کردن، تاشینی توکەبەر، خەتێنە کردن، تاشینی مووی بن باڵ و شۆردنی پیسایی جەستە دوای چوونە سەر ئاو. دەستەیەکیتر دەڵێن: ئایینەکانی حەجە. یا ئەم وتارەی خوای گەورەیە کە فەرمووی: ئەی ئیبراهیم من تۆ دەکەمە رێبەری خەڵك. وتی: کورەکانیشم؟ وتی: بەڵێنی من ستەمکاران ناگرێتەوە (بقرە/٢/١٢٤). ئەمە وتاری باوکی ساڵح و موجاهیدە. کەسانیتر دەڵێن: قسەکان شەش دانەن: ئەستێرەکان، مانگ، خۆر، ئاگر، کۆچ کردن لەزادگا و خەتێنە کردن.

حەسەن دەڵێت: تاقی کردنەوەی ئەو فەرمانلدرانی بەسەربرینی کوڕەکەی بوو. دەڵێت: خوا ئەوی بەم کارە تاقی کردەوە و ئەو زانی خوا پایەدارە و هیچ و هەرگیز نەبوون رێگەی بۆ لای ئەو نییە. کەواتە رویکردە خوا کەزەمین و ئاسمانەکانی ئافراند. ئەو لەزادگاکەی خۆی کۆچی کرد و هەوڵیدا کوڕەکەی خۆی سەربېرێت و خۆی خەتێنە کرد. کەسانیتر شتیتریان وتووە کە لەم مێژووە کورتەدا ناگونجێت. هەر ئەوندە ئاماژەمان پێدا تا بەشەکانی ئەم کتێبە لەم باسە بێبەش نەبێت.

## چارەنوسی دوژمنی خوا نەمرود و گیاندانی ئەو

ئێستا ئاماژە بەداستانی دوژمنی خوا نەمرود دەدەین. ئەوەی کارەکەی لەم جیهاندا بەوە کۆتایی هات لەیاخی بوون بەرامبەر خوا و درێژ کردنەوەی زەمان لەلایەن خواوە بۆ ئەو. ئەو یەکەم ستەمکار و یاخی جیهان بوو. داستانی سوتاندنی ئیبراهیم لە لایەن ئەو، ئەوە بوو پێشتر ئاماژەمان پێدا. ئەو ئیبراهیمی لەشارەکەی دەرکرد و سوێندی خوارد خوای ئیبراهیم دەدۆزێتەوە. چوار جوجکە لاشخۆری هەڵگرت و ئەوانی بەگۆشت و مەی پەروەردە کرد تا گەورە و بەهێزبوون. دواتر لاشخۆرەکانی بەتابووتێکەوە بەست و تیایدا دانیشت و پیاوێکی لای خۆی دانیشاند تا گۆشتی بۆ لاشخۆرەکان هەبێت. لاشخۆرەکان هەڵفرین و ئەویان بردە ئاسمان تا ئەو جێگەی دەیتوانی لەسەرەوە زەوی ببینێت. کێوەکانی بینی لەمێرووله دەچوون. گۆشتی بۆ ئەوان بەرز کردەوە و ئەوەندە بەرزبوونەوە کاتێک لەزەوی دەروانی، بەو شێوەی بینی کەدەریایەك زەوی لەخۆ گرتووە وەك چۆن ئاو کەشتیەك لەخۆی دەگرێت. زۆر بەرز بوویەوە و لە تاریکیەکی قووڵ گرفتار بوو کەژێر و سەری خۆی نەدەزانی. ترسا و گۆشتی فرێدا و لاشخۆرەکان بە دوای گۆشت بەرەو خوار هاتن. کاتێك کێوەکان لەلاشخۆرەکانیان روانی و ئەوانیان دەبینی بەرە زەوی دەهاتن و دەنگی باڵەکانی ئەوانیان بیست، دەیانویست لەشوێنی خۆیان بجووڵێن بەڵام تەکانیان نەخوارد و ئەمە هەمان وتاری خوای گەورەیە کە دەفەرمێت: فریوی گەورەی خۆیان بەرز کردەوەکە و وەڵامەکەی لای خوایە هەرچەندە فێڵەکەی ئەوان ئەوە بێت کە لەزیانی ئەوان کێوەکان بیانەوێت بجووڵێن (ابراهیم/١٤/٦٤).هەڵفرینی ئەوان لەبیت المقدس و نیشتنەوەیان لەکێوی دخان بوو.

کاتێك بینی ناتوانێت هیچ کارێك بکات، دەستی بەدروست کردنی بینایەك کرد و دروستی کرد و بەرزی کردەوە و نەمرود رۆشتە سەری و بەگومان خۆی لە خوای ئیبراهیم دەروانێت. خۆی پیس کرد وپێش ئەوە بێ خۆ پیس کردن ژیانی بەسەر دەبرد. خوا پایەی لەبیناکەی ئەوان سەندەوە و ئەو بینایەی روخاند و کۆشکەکە دارما و زمانەکان لەو کاتەوە لە ترسا جۆراوجۆر و تێکەڵ بوون و خەڵك بەحەفتا و سێ زمان ئاخاوتن بەڵام پێش ئەوە زمانی خەڵك سریانی بوو.

بەم شێوەیان گێراوەتەوە کەئەو خۆی پیس نەدەکرد بەڵام ئەم قسەیە بەهای نییە چوونکە سرشتی خەڵك بە شێوەیەکە هیچ کەس تەنانەت پێغەمبەران لێی بێبەش نین. پێغەمبەرەکان پەیوەندییەکی بەهێزتریان لەگەڵ دنیادا هەبوو و گەوهەرێکی گرانبایتر، لەگەڵ ئەمەیشدا دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و دەیانکرد (مەبەست پیساییە). ئەگەر کەسێك دەیویست لەم کارە بێبەش بێت، پێغەمبەرەکان لەوان شیاوتر بوون چوونکە ئەوان شەریفتر و لە خوای گەورە نزیکتر بوون. ئەگەر لەم ڕێگاوە ئەو پاشایەتییەکەی گەورەتر و بەربلاوتری لەژێر دەستدا بوو، هاوشێوەی ئەوەیە کە بەسەربەخۆیی فەرمانڕەوایی نەکرد، ئەسکەندەر لەو پاشایەتییەکەی گەورەتر و بەربلاوتری بوو و لەگەڵ ئەمەیشدا شتێکی هاوشێوەی ئەمە لەبارەی ئەو نەوتراوە.

زەید کوڕی ئەسلەم دەڵێت: خوای گەورە دوای ئیبراهیم فریشتەیەکی بۆلای ئەمرود نارد کەچوار جار بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا بانگێشتی کرد بەڵام ئەمرود ڕازی نەبوو و وتی: ئایا جگە لەمن خوایەك هەیە؟ فریشتە وتی: سوپاییەکانت تا سێ ڕۆژ کۆبکەرەوە. ئەو سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و لەم کاتەدا خوا دەرگایەك لەمێشەکانی بۆ ئەوان کردەوە و ئەمانە ئەوەندە چڕ و پڕ بوونن، کاتێك هەتاو هەڵات ئەمرودییەکان لەبینینیان ناتەوان بوون. خوا فەرمانی بەمێشەکاندا هەموو ئەمرودییەکان بخۆن و جگە لەئێسقانەکان هیچیان نەهێشتەوە و پاشا تەندروست مایەوە و زیانی پێنەگەشت. خوا مێشێکی بۆ ئەو دانا کە ڕۆشتە قوڵایی لوتییەوە و ئازاری دەدا. ئەمرود بە زیندویی مایەوە و کاری گەشتە شوێنێك بە چەکوش کێشای بەسەری خۆیدا. خۆشەویستترین کەس لای ئەو، کەسێك بوو کەدوو دەستی خۆی دەکرد مشت و دەیکێشا بەسەری ئەودا. ڕۆژگاری پاشایەتی ئەو چوارسەد ساڵی خایاند. خوا ئەوی مراند. ئەمرود ئەو کەسە بوو ئەو کۆشکەی دروست کرد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەمرود کوڕی کەنعان فەرمانڕەوایی ڕۆژ ئاوا و ڕۆژهەڵاتی دەکرد و ئەمە وتارێکە زانایان و ئاگاداران لەبەسەرهاتەکانی جیهان و مێژووی پاشاکان بەڕاستی نازانن. ئەمانە بەم ڕاستییە ڕازین کەئیبراهیم لەڕۆژگاری ئاژی دهاکی تازی لەدایك بوو – پێشتر ئاماژەمان بەدەستەیەك لەباسەکانی پەیوەندیدار بەم بابەتەدا -

ئەو بوو پاشایەتی رۆژهەلات و رۆژئاوای پێبرا. ئەوەی دەڵێت ئاژی دهاك – ئەو کەسەی پاشایەتی جیهانی کرد- ئەمرودە، راستی ئەوتووە چوونکە زاناکانی کۆن دەڵێن ئەژادی ئەمرود لەنێوان ئەبتیەکان ناسراو و ناوداره بەهەمان شێوە کەئاژی دەهاك لای ئێرانییەکان ناوداره. ئاژی دهاك بوو ئەمرودی کردە فەرمانرەوایی (سواد) و سەرزەمینەکانی پەیوەست بەسوادی لەچەپ و راستی بەو بەخشی و ئەوی لەگەڵ کورەکانی کردە کارگوزارانی ئەو سەرزەمینە. ئەو لەدنیا دەگەرا و زادگای ئەو و باوباپیرانی دۆنباوەند لەکێوەکانی تەبەرستان بوو و لەوێ بوو فەریدون دیل و زیندانی کرد.

بەمشێوەیە بەسەرهاتی بخت النصر کەدەستەیەك دەڵێن ئەو پاشایەتی سەراسەری زەمینی دەکرد، بەلأم ئەمە راست نییە. ئەو سپاسالارێك لەنێوان ئەهواز تا سەرزەمینی رۆم لەرۆژئاوایی دیجلە لەلایەن (لۆهراسب)بوو چوونکە لۆهراسب سەرقاڵی شەر لەگەڵ تورکەکان بوو و لەشاری بەلخ دەژیا. چوونکە مانەوەی لەوێ بۆ شەر لەگەڵ تورکەکان درێژەی کێشا، شاری بەلخی دروست کرد. پێش ئەو هیچ کام لەئەبتیەکان یەك بست لەخاکەکەیان بەسەربەخۆیی لەژێر فەرمانی خۆیاندا ئەبوو، ئێستا چۆن دەتوانن فەرمانرەوایی ئەو پانتاییە بەرفراوانەیان لەژێر دەستا بێت؟ رۆژگاری فەرمانرەوایی ئەمرود لەسواد چوارسەد ساڵی خایاند. دوای لەناوچوونی ئەو کورێك، کەپێی دەوترا ئەبت کوری قعەد بۆ ماوەی سەد ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. دواتر کداوس کوری ئەبت هەشتا ساڵ، دواتر بالش کوری کداوس سەد و بیست ساڵ، دواتر ئەمرود کوری بالش یەك ساڵ و یەك مانگ. هەمووی ئەمانە ٧٠١ ساڵ پێکدێنێت. ئەمرود لەرۆژگاری ئاژی دهاك دەژیا و خەڵك سەبارەت بەئەمرود گومانی هەندێ شتیان بردوە کەئاماژەمان پێدا. کاتێك فەریدون بەپاشایەتی گەشت و ئاژی دهاکی سەرکوت کرد، ئەمرود کوری بالشی کوشت و ئەبتیەکانی ئاوارە کرد و کوشتارێکی گەورەی لەناو ئەواندا بەرێخست.

## بەسەرهاتی لوط و خەڵکەکەی

کۆچکردنی لوت لەگەڵ ئیبراهیم بۆ میسر و گەڕانەوەی بۆ شام و نیشتەجێ بوونی لوت مان لە سەدوم ئاماژە پێدا. کاتێك لەوێ مایەوە، خوا ئەوەی وەك پێغەمبەر ڕەوانە کرد. خەڵکی ئەوێ بەخوای گەورە ناباوەڕ بوون وکاری قێزەونیان ئەنجام دەدا بەهەمان شێوە کەفەرموویەتی: بیربێنەرەوە لوت کاتێك بەخەڵکەکەی خۆی وت: ئێوە ئەو کارە قێزەونە ئەنجام دەدەن کەپێش ئێوە کەس لەجیهانیان نەیانکردووە. ئێوە لەگەڵ پیاوان جووت دەبن و ڕێگەی (بەبەرهەم بوون و لەدایك بوون)دەگرن و لەناو کۆری خۆتانا کاری ناپەسەندی زۆر دەکەن (عنکبووت/٢٨/٢٩—٢٩). ڕێگە گرتنیان بەشێوەیەك بوو کاتێك ڕێبوارێك تێدەپەری، دەیانگرت و کاری قێزەونیان لەگەڵ دەکرد کەجووت بوون لەگەڵ پیاوان بوو. کاری ناپەسەندی ئەوان لەناو کۆردا ئەوە بوو هەر کەس تێپەریایە دەیانگرت و دەیاندا بە زەویدا و گاڵتەیان پێدەکرد. هەندێ دەڵێن: لەناو کۆرەکان بە اشکرا لەبەر چاوی یەکتر تریان لێدەدا و دەستەیەك دەڵێن: بە ئاشکرا لەناو کۆرەکان لەگەڵ یەك جووت دەبوون. لوت ئەوانی بۆ پەرستنی خوا هاندەدا و دەیوت دەزی مەکەن، تێکەڵاوی کارە قێزەونەکان نەبن و لەپیاوان نزیك مەبنەوە. ئەوانی لەئەشکەنجە مەترسیدارەکان ئاگادار دەکردەوە بەڵام سوور بوون لەسەر گوناح و بۆلای خوا نەدەگەڕانەوە. لەم ئامۆژگارییانە وانەیان وەرنەدەگرت وئامۆژگاریەیکانی ئەو دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر لەناو گوناحەکاندا رۆچن و گەشتنی سزای خوایی خێراتر بکەن چوونکە ئاگادار کردنەوەی پێغەمبەری خوایان بە درۆ دەزانی و پێیان دەوت: ئەگەر راست دەکەیت سزای خوای بەسەر ئێمەدا ببارێنە. کاتێك کاری ئەوان زۆری خایاند و ئەوان لەگومرایی خۆیان زیاتر رۆچوون، لوت لەخوا پاڕایەوە لەناویان ببات.

کاتێك خوا ویستی هاوکاری پێغەمبەرەکەی خۆی بکات و ئەوان لەناو بەرێت، جبرەئیلی لەگەڵ دوفریشتەی تر- یەکیان میکاییل و ئەویتریان ئیسرافیل- نارد. ئەوان لەروخساری پیاوان بەرێکەوتن و بەپێ رۆشتن. خوا پێیانی فەرموو سەرەتا برۆنە لای ئیبراهیم و سارە و بە ئیسحاق و بەدوای ئەو یەعقوب دڵخۆشیان بکەن.

کاتێك رۆشتنە لای ئیبراهیم، ئیبراهیم لەهاتنی ئەوان شادمان بوو. لەم کاتەدا پانزە رۆژ بوو میوانی بۆ نەهاتبوو و لەم دڵەنگ و بەهەر هاتووێك شادمانی خۆی نیشان دەدا. ئەو، ئەو میوانانەی بینی پێشتر کەسی جوان و رێزداری وەك ئەوانی نەبینیبوو. بەخۆی وت: جگە لەخۆم کەس میوانداری ئەوان ناکات. بەدەستی خۆم رێز لەوان دەگرم. رۆشتە لای هاوسەرەکەی خۆی و بۆ ئەوان بەرخێکی برژاوی هێنا و بۆی دانان. ئەوان لەخواردن دەستیان هەڵگرت. کاتێك بینی دەستی ئەوان بۆ خواردن درێژ نابێت، ئەوانی بەناناشنا بینی و ترسی ئەوانی کەوتە دڵەوە. فریشتەکان پێیان وت: مەترسە، ئێمە فریشتەین و بەرەو لای خەڵکی لوت دەرۆین. ژنەکەی سارە وەستا بوو. پێدەکەنی لەوەی سەبارەت بەمەبەستی خوا دەیزانی و لەچارەنوسی خەڵکی لوتی رادەما. ئێمە ئەو ژنەمان بە ئیسحاق مژدەدا و بەدوای ئەو یەعقوب. ژن لەروخساری خۆیدا و وتی: هاوار، ئایا لەم تەمەنەدا منداڵم دەبێت؟ مێردەکەی من کە لێرەدایە پیرە! ئەمە کارێکی سەرسورهێنەرە. فریشتەکان وتیان: ئایا لەکاری خوا سەرت سوردەمێنێت؟ بەخشینەکان و بەرکەتەکانی خوا بۆ ئێوەیە ئەی بنەماڵە. ئەو خوایەکی گەورە و شیاوی رێزە (هود/١١—٧٠—٧٣).

کاتێك ترس لەئیبراهیم دوور کەوتەوە و مژدەی پێگەشت، دەستی بەپرسیار کردن سەبارەت بەنەتەوەی لوت لەجبرەئیل کرد و وتی: چی دەبینی ئەگەر لەم شارەدا پەنجا کەس خواپەرەستی لێبێ؟ فریشتەکان وتیان: ئەگەر لەنێوان ئەوان پەنجا کەس خواپەرست هەبن ئەوان ئەشکەنجە ناکات. وتی: ئەگەر چل کەس بن؟ وتیان: نایکات. وتی: ئەگەر سی کەس بن؟ وتیان: نایکات. تا گەشتنە دە کەس. وتیان: ئەگەر دە کەس بن؟ وتی: چ سوود لەو خەڵکەی لەناویاندا دە کەس باشتر لەوان نەبێت؟ ئەوسا ئیبراهیم وتی: لەم شارەدا لوت هەیە؟ فریشتەکان وتیان: ئێمە زاناترین لەوەی لەم شارەدا کێ هەیە. بێ گومان ئەو لەگەڵ بنەماڵەکەی رزگار دەکەین جگە لەهاوسەرەکەی کە لەناو لەناوچووەکاندا ماوەتەوە (عنکبووت/٢٩/٣٢).

فریشتەکان بەرەو سەدووم دێهاتەکەی لوت بەرێکەوتن. کاتێك گەشتن بینیان لوت لە سەر زەوی کار دەکات. خوای گەورە فەرمووو بووی لەناویان نەبەن مەگەر ئەوەی لوت

چوار جار بەزمان رەزامەندی لەسەر لەناوبردنیان دەربڕیت. رۆشتنە لای و وتیان: ئەمشەو میوانی تۆین. ئەوانی بردە ماڵەوە. دوای ماوەیەك، روی تێکردن و وتی: ئایا دەزانن خەڵکی ئەم دێ یە چی دەکەن؟ بەخوا لەسەر زەوی لەمان ناپاکتر ناناسم. ئەمەی چوار جار هێنایە سەر زمان.

دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبوو، بەڵکو فریشتەکان چاویان بەکچەکەی کەوت و پێیان وت: کچەکە، ئایا لێرەدا ماڵێك هەیە؟ وتی: هەیە. لێرەدا بمێننەوە و مەیێنە ناو تا خۆم بگەرێمەوە لای ئێوە. ئەو لەخەڵکەکەی خۆیان دەترسا. هاتە لای باوکی و وتی: ئەی باوکە، چەند لاوێکم لەدەروازی شار بینی کەلەوان جوانترم هەرگیز نەبینیوە. نەکا خەڵکەکەی تۆ ئەوان بگرن و ریسوایان بکەن. خەڵکەکەی ئاگاداریان کردبوویەوە میوان لەخۆ نەگرێت. ئەوانی هێنایە ماڵەوە و جگە لەئەندامانی خێزانەکەی کەس لەم کارە ئاگادار نەبوویەوە. ژن رۆشتە دەر و چاوی بەخەڵکەکە کەوت و پێیانی وت: چەند کەسێك هاتونەتە میوانی ئێمە جوانتر و خۆشبۆنترم لەوان تا ئێستا نەبینیوە. خەڵك بەپەلە بەرەو لای ئەوان رایانکرد. وتی: خەڵکینە لەخوا بترسن و بە توند وتیژی من و میوانەکانم سوك و ریسوا مەکەن. ئایا لەناو ئێوەدا پیاوێکی بەهێز و خۆراگر نییە؟ (هود/١١/٧٨). ئەوانی لەخراپە دوور دەخستەوە و بۆ چاکە بانگی دەکردن و وتی: ئەمە کچەکانی من، بۆ ئێوە پاکترن لەوەی دەتانەوێت (هود/١١/٧٨). وتیان: تۆ دەزانیت ئێمە حەزمان لەکچەکانی تۆ نییە، بێ گومان دەزانی چیمان دەوێت (هود/١١/٧٩). ئایا ب تۆمان نەوتووە هیچ کەس وەك میوانی رانەگریت؟ (حجر/١٥/٧٠). کاتێك بەقسەکانی رازی نەبوون، وتی: خۆزگە دەسەڵاتی ئێوەم دەبوو یا دەبوومە ستوونێکی بەهێز (هود/١١/٨٠). یانی خۆزگە یار یا کەس و کارم دەبوو تا هاوکاریان دەکردم و منیان لەئێوە پەنا دەدا. کاتێك ئەمەی وت نێردراوان دڵیان بۆی سوتا و ئەوان وتیان: ستوونەکەی تۆ زۆر بەهێزە. خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەنارد مەگەر ئەوەی لەناو دارایيەکی فراوان کە ئەوەی لەخەڵکانیتر بێ نیاز دەکرد و دژێکی بەهێز لەخزم و کەس و کار کەبوونە هاورێ و هاوەڵانی. لوت دەرگاکەی بەست و ئەوان دەستیان بەراوێژ کردن وچارەسەر

کردن کرد و لوت دەرگاکەی کردەوە و ئەوان هاتنە ناو. جبرەئیل لەخوا فەرمانی بۆ سزادانیان ویست و خوا فەرمانیدا. باڵەکانی خۆی کردەوە و هەموویانی کوێر کرد. ئەوان هاتنە دەر و یەکتریان پێشێل کرد چوونکە کوێربوون و دەیانوت: خێراکەن و خۆتان رزگار بکەن کە لەماڵی لوت جادوگەترین کەسانی سەر زەوی دانیشتوون. فریشتەکان بەلوتیان وت: ئێمە نێردراوانی خوای تۆین. دەستی ئەوان بەتۆ ناگات. ئەندامانی خێزانەکەت لەکاتژمێرێکی شەو ببەرەدەر و کەس لەئێوە نامێنێتەوە مەگەر ژنەکەی تۆ کە ئەو سزایەی پێدەگات کەبەوانیتر دەگات. کاتی سزادانی ئەوان بەرەبەیانە، ئایا بەرەبەیان نزیك نییە؟(هود/١١/٨١). ئێوە بۆ ئەو رێگە و ئەو شوێنە برۆن کەفەرمانتان پێ دەدەن (حجر/١٥/٦٥).

خوا ئەوانی بردە شام و لوت وتی: هەرئێستاکە ئەوان لەناو بەرن. وتیان کاتی سزادان بەرەبەیانە، ئایا بەرەبەیان نزیك نییە؟ (هود/١١/٨١). کاتێك بەرەبەیان گەشت جبەرئیل یا میکاییل باڵەکانی خۆی کردە ژێر سەرزەمینەکەی ئەوان و پێنج دێهاتەکەیان و ئەوانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە بەشێوەیەك ئاسمانییەکان ئاوازی کەڵەشێر و زووزەی سەگەکانی ئەوانیان بیست. ئەوانیان سەر و ژێر و بەردبارانی ئەوان دەستی پێ کرد (سجیل) و ئەو کەسانەی لەدەرەوەی دێهاتەکان بوون، لەناو برد. ژنی لوت ئەو دەنگەی بیست و وتی: هاوار، خەڵکەکەم! بەردێکیش بەو گەشت و ئەوی کوشت. خوا لوت و کەسەکانی رزگار کرد مەگەر ژنەکەی کەرۆشتە ریزی لەناوچووەکان. دەڵێن: لەوێ چوارسەد هەزار کەس دەژیان. ئیبراهیم لەوێ تێدەپەری و دەیوت: سەدوم رۆژێك لەناودەچێت. شارەکانی خەڵکەکەی لوت پێنج دانە بوون: سەدوم، سەبعە، عەمرە، دوما، سەعوە. سەدوم گەورەترین دێ بوو.

## مردنی سارە هاوسەری ئیبراهیم و ژن و مناڵەکانی ئەو

کەس لەمەدا گومانی نییە سارە لەشام مرد و لەم کاتەدا ١٢٧ ساڵ تەمەنی بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەدێهاتی ستەمکاران و یاخیان لەکەنعان مرد. دەستەیەك دەڵێن: سارە دوای هاجەر ماوەیەك ژیا. گێڕانەوەی راست ئەوەیە هاجەر پێش سارە مرد وەك لەوتوێژی ئیبراهیم لەچوونی بۆ مەککە ئاماژەمان پێدا و ئەمە راستە

بەخواستی خوا.

کاتێك سارە مرد، ئیبراهیم قتورا کچی یەقتن، ژنێك لەکەنعانییەکانی بۆ هاوسەری هەڵبژارد و ئەو شەش کوری بۆ ئیبراهیم هێنایە دونیا: نەفشان، موران، مەدەن، نەشەق، سەرەح، مەدیان. هەموو مناڵەکانی ئیبراهیم بەئیسحاق و ئیسماعیلەوە هەشت کەس بوون. ئیسماعیل گەورەترین کوری ئەو بوو. لەبارەی مناڵەکانی جگە لەمە داستانی تریش هەیە. بەڕبەرییەکان لەرەچەڵەکی نەفشانن و خەڵکانی مەدین – بنەماڵەی شوعەیب- لەمناڵەکانی مەدیان.

دەڵێن دوای قەتورا ژنێکیتری بەناوی حەجون کچی ئەهیری بەهاوسەری هەڵبژارد.

## مردنی ئیبراهیم و ئەو کتێبانەی بۆ ئەو دابەزین

دەڵێن: کاتێك خوا ویستی گیانی ئیبراهیم بستێنێت، فریشتەی مەرگی لەروخساری پیرەپیاوێکی کۆنساڵ بۆ لای نارد. ئیبراهیم بینی و ئەو لەگەرمادا خواردنی بەخەڵك دەدا و پیرەپیاوێکی زۆر بەتەمەن بوو.

گوێدرێژێکی بۆلای ئەو ناردە سواری بوو و هاتە لای. پیرەپیاو تیکەی هەڵدەگرت تا بیبات بۆ دەمی بەڵام پێشەکی دەیکردە چاو و گوێچکەی خۆی و دواتر دەیخستە ناو دەمییەوە. کاتێك بەسکی دەگەشت، لەخوارییەوە دەهاتە دەر. ئیبراهیم داوای لە خوا کردبوو گیانی نەستێنێت تا خۆی داوای دەکات. ئیبراهیم وتی: ئەی پیرەپیاو بۆ وا دەکەیت؟ وتی: دەردی پیرییە. ئیبراهیم وتی: تەمەنت چەندە؟ پیرەپیاو دوساڵی بەسەر تەمەنی ئیبراهیم زیاد کرد و بەتەمەنی خۆی لەقەڵەمدا. ئیبراهیم بەخۆی وت: دو ساڵیتر ماوە گیرۆدەی چارەنوسی ئەم پیاوە بم. خوایە من ببەرەوە بۆ لای خۆت. پیرەپیاو هەستا و گیانی ئەوی گرت. لەم کاتەدا ٢٠٠ ساڵی تەمەن بوو.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو ١٧٥ ساڵی بوو. من لەم وتارەدا باوەڕێکم هەیە، چۆن دەتوانرێت ئیبراهیم کەسانێکی دو ساڵ یا زیاتر لەوە ببینیبێت کە لەو گەورەترن چوونکە کەسێك دوسەد ساڵ ژیا بێت چۆن کەسێکی نەبینیوە ئەم ئەندازە کەمە

لەتەمەنی ئەو گەورەتر بێت؟ بەڵام وایان گێراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو بەناچاری تەمەنی نوحی بیستووە و زانیویەتی ئەو گرفتاری ئەم بەدبەختییەنەبووە.

ئەبوزەری غەفاری لەپێغەمبەر(د.خ) حەدیسێك دەگێڕێتەوە كە فەرمووی: خوا دە صەحیفەی بۆ ئیبراهیم نارد. وتی: وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ، صەحیفەكانی ئیبراهیم چی بوون؟ فەرمووی: هەموویان ئامۆژگاری: ئەی پاشای لەخۆرازی زاڵی تاقی كراوە، تۆم نەنارد سامانەكانی ئەم جیهانە كۆبكەیتەوە. تۆم بۆیە نارد تا داواكارێكی ستەم لێكراو لەمن بگەڕێنیتەوە چوونكە من ئەم داواكارییە بێ وەڵام نانێرمەوە ئەگەر داوای كافرێكیش بێت.

لەناویدا ئامۆژگاری بوو لەم شێوەیە: عاقڵ شیاوە ئەگەر عەقڵی خۆی نەدۆڕاندبێت، چەندین كاتژمێری تایبەتی هەبێت، كاتژمێرێك تیایدا لەگەڵ خوای خۆیدا راز و نیاز بكات، كاتژمێرێك كەبیر لەئافراندنەكانی خوا بكاتەوە، كاتژمیرێك لێكۆڵینەوە لەكارەكانی خۆی بكات و لەخۆی بپرسێتەوە و كاتژمێرێك لە خواردن و خواردنەوەی خۆی بروانێت تا بزانێت لەرێگەی حەڵاڵەوە بەدەست هاتووە یا نە. عاقڵ دەبێت رێبوار نەبێت مەگەر لە سێ رێگا: توێشو گرتن بۆ ئەو دنیا، چاك كردنی باری ژیان و چێژوەرگرتن نە لەرێگەی حەرام. عاقڵ پێویستە بینا بێت لەزەمانی خۆی، تێكۆشەر بێت لەكاری خۆی و پارێزەر بێت لەزمانی خۆی. هەر كەسێك وتاری خۆی لەكرداری خۆی بژمێرێت، قسەی كەمە مەگەر لەبارەی ئەوەی بەكەڵكی دێت.

ئەو یەكەم كەس بوو ماڵی دروست كرد، یەكەم كەس میوانداری میوانی كرد و یەكەم كەس بوو شەرواڵی لەپێ كرد. جیاواز لەمانە شتی تری زۆریان سەبارەت بەئیبراهیم باس كردووە.

## چارەنوسی منداڵەکانی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم

پێشتر ئاماژەمان پێدا بۆ ئیبراهیم کورەکەی ئیسماعیلی لەبارەگای خوادا هێشتەوە. ئەو ژنێکی لەجۆرهۆم هەڵبژارد و بەفەرمانی ئیبراهیم دەستبەرداری بوو و ئەوسا ژنێکیتری هەڵبژارد کەخاتوونێك بوو کچی مێفیازی جۆرهۆمی. ئەمە ئەو کەسە بوو ئیبراهیم پێیوت: بەهاوسەرەکەت بڵێ بەردەرگای ماڵەکەی بەهێزبووە و من لەو رازیم. ئەو بۆ ئیسماعیل دوانزە کوری هێنایە دنیا: نابت، قەیدار، ئەزیل، میشا، موسەممەع، ردما، ماش، ئازەر، قەتورا، قافس، تەمیا و قەدمان. تەمەنی ئیسماعیل – بە پێی گومان- ١٣٧ ساڵ بوو. لەدوکوری ئیبراهیم نابت و قەیدار خوا عەرەبەکانی دروست کرد. خوا ئیسماعیلی وەك پێغەمبەری عەملاقان و هۆزەکانی یەمەن هەڵبژارد. ناوی منداڵەکانی ئیسماعیل بەشێوەیتریش دەبەن. کاتێك زەمانی مەرگی هات، براکەی ئیسحاقی کردە جێنشینی خۆی و کچەکەی دا بە عەیسی کوڕی ئیسحاق. ئەویان لای ئارامگاکەی دایکی هاجەر لەحێجر بەخاك سپارد.

## بیرکردنەوەی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و منداڵەکانی

دەڵێن: ئیسحاق لەگەڵ رەفقا (رەفەق) کچی بەتویل پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و بۆ ئەو عەیس و یەعقوبی بەیەك سك هێنایە دنیا. ئەم دووانە، دوانە بوون. عەیس گەورەتر و تەمەنی ئیسحاق لەم کاتەدا شەست ساڵ بوو. عەیس کوڕی ئیسحاق، ئەسمە کچی مامی (ئیسماعیل )ی بەژنی هەڵبژارد و بۆ ئەو روم کوڕی عەیسی هێنایە دونیا. هەموو منداڵەکانی ئەسفەر لەڕەچەڵەکی ئەون. دەستەیەك خەڵك گومان دەکەن ئەشبان یش لەمنداڵەکان و رەچەڵەکی ئەوە.

یەعقوب کوڕی ئیسحاق کەهەمان ئیسرائیل بێت، کچە خاڵەکەی لیا کچی لیان کوڕی بەتویلی کردە هاوسەری خۆی و روبیلی و (گەورەترین منداڵی بوو) شەمعون، لاوی، یەهودا، زبالون، لەشحر یا یەشحری چاویان بەدنیا هەڵهێنا. لیا مرد و یەعقوب

خوشکەکەی ئەوەی بەناوی راحیا کردە هاوسەر کە یوسف و بنیامینی هێنایە دونیا. ناوی ئەو بەزمانی عەرەبی شەدادە. لەدوو کەنیز چوار منالی بوو: دان، نەفتالی، جاد و ئەشر. یەعقوب دوانزە منالی بوو.

سەدی دەڵێت: ئیسحاق کەنیزێکی کردە ژنی خۆی کە بەدوو کوڕ دووگیان بوو. لەکاتی لەدایك بوونی منالەکان، یەعقوب هەوڵیدا زووتر بێتەدەر بەلام عەیس وتی: سوێند بەخوا ئەگەر زوتر لەمن برۆیتە دەر، لەسکی دایکم هەرا و ئاژاوە دروست دەکەم و دەیکوژم. یەعقوب کشایەوە و عەیس هاتە دەر و یەعقوب پاژنەی ئەوەی گرت و هاتە دەر. لەبەر ئەمە ئەویان بە یەعقوب (شوێنکەوتوو)) ناوبرد و براکەی کە یاخی ونافەرمانی کرد، ناویاننا عەیس. عەیس باوکی زیاتر خۆشدەویست و یەعقوب دایکی. عەیس راوچی بوو، کاتێك ئیسحاق پیر و کوێر بوو پێی وت: کورم، گۆشتی راوم دەرخوارد بدە و دواتر وەرە لای من تا لەخوا بۆ هاودەمی تۆ بپاڕێمەوە چوونکە باوکم ئەم کارەی بۆ من کرد. عەیس پیاوێکی تووکن و یەعقوب بێ موو بوو. دایکیان ئەمەی بیست و بەیەعقوبی وت: کوڕم مەڕێك سەر ببرە و بیبرژێنە و پێستەکەی لەبەر بکە و برۆ لای باوکت و بلێ منم، کوڕەکەت عەیس. یەعقوب ئەم کارەی کرد و کاتێك هات وتی: باوکە بخۆ. ئیسحاق پرسی : تۆ کێیت؟ یەعقوب وتی: عەیسم. ئیسحاق دەستی لەجەستەی عەیس دا و وتی: دەستم بەر جەستەی عەیس دەکەوێت و لووتم بۆنی یەعقوب دەکات. دایکی وتی: بیخۆ ئەوە عەیسە. ئیسحاق خواردی و داوای لەخوا کرد تا پاشاکان و بنەماڵەکان لە رەچەلەکی ئەم بن.

یەعقوب هەستا و عەیس لەراو گەرایەوە و بەباوکی وت: ئەو نێچیرەی ویستبووت، بۆم هێناوی. ئیسحاق وتی: کوڕم براکەت پێشت کەوت. عەیس سوێندی خوارد بێ چەند و چوون یەعقوب دەکوژێت. ئیسحاق وتی: کورم دۆعایەکیش بۆتۆ ماوەتەوە. دواتر لەخوا پارایەوە ژماری منالەکانی ئەو بەئەندازە بەرد و خۆلی بیابان زیاد بکات و جگە لەخۆیان کەس فەرمانرەوایەتیان نەکات.

یەعقوب لەترسی براکەی پەنای بردە بەرخالی. شەو دەرۆشت و رۆژ لەشوێنێك خۆی

دەشاردەوە و دەخەوت. لەبەر ئەمە ئەویان ناو نا ئیسراییل (شەو رەو). یەعقوب هەردو کچی خاڵۆی خۆی کردە هاوسەری خۆی و لەبەر ئەمەبوو خوای گەورە فەرمووی: حەرامە دوو خوشك لەیەك کاتدا بکەنە هاوسەری خۆتان مەگەر ئەوەی ئەم کارەتان پێش دابەزینی ئەم ئایە کردبێت (نسا/٤/٢٣). یەعقوب لەم دوو خوشکە منالی بوو. راحیل بەژانی لەدایك بوونی بنیامینەوە مرد و یەعقوب بریاریدا بۆ بیت المقدس بگەرێتەوە. خاڵۆی ڕانە مەرێکی پێبەخشی. کاتێك بەرێکەوتن، توێشویان نەبوو و هاوسەری یەعقوب بەیوسفی وت: بتێك لەبتەکانی باوکم بدزە تا داوای توێشوی لێبکەین. یوسف یەکێك لەبتەکانی باوکی ئەوی دزی.

یەعقوب یوسف و براکەی بنیامینی زۆر خۆش دەویست لەبەر ئەوەی ئەم دووانە دایکیان نەبوو. یەعقوب بەیەکێك لەشوانەکانی خۆی وت: ئەگەر کەسێك هات و لێی پرسین کێین، بڵێن: نۆکەرەکانی یەعقوبین کەبەندەی عەیسە. عەیس ئەوانی بینی و هەمان پرسیاری کرد و هەمان وەڵامی بیستەوە و لەبەر ئەمە دەستی لەیەعقوب هەڵگرت و یەعقوب لەشام دابەزی و لەوێ نیشتەجێبوو.

ئیسحاق لە تەمەنی ١٦٠ ساڵیدا مرد و لەپاڵ ئارامگای باوکی بەخاك سپێردرا.

## داستانی ئەیووب

ئەو پیاوێکی رۆمی لەتەباری عەیس بوو. ئەژادنامەی ئەو بەم شێوەیە: ئەیووب کوڕی موس کوڕی روعیل کوڕی عەیس. هاوسەرەکەی کە لەلایەن خواوە فەرمانی پێدرا دەستە گسکێك هەڵبگرێت و بەوە لێی بدات (ص/٣٨/٤٤). لیا کچی یەعقوب کوڕی ئیسحاق بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەو رەحمەت کچی ئیبراهیم کوڕی یوسف و دایکی لەمناڵەکانی لوت بوو. کاتێك شتێکی دەویست نوێژی دەخوێند و دواتر داوای دەکرد.

داستانی ئەو و هۆکاری گیرۆدە بوونی لەتاقی کردنەوەدا بەم شێوە بوو: ئیبلیس

بیستی فریشتەکان لەکاتی وتووێژ لەگەڵ یەکتر، سڵاو بۆ ئەیووب دەنێرن. لەبەر ئەمە رژدی پێبرد و داوای لەخوا کرد ئەو بەسەر ئەیووبدا زاڵ بکات تا بەهێز بوونی ئەو لەدینەکەی هەڵبسەنگێنێت ( ئەگەر بتوانێت لەخواپەرستی دووری بکاتەوە). خوا ئەوەی تەنیا بەسەر سامانی ئەیووبدا زاڵ کرد. ئیبلیس گەورەکانی سوپای خۆی لەدێوەکان کۆکردەوە. هەموو ملکەکانی بەسەنییە لە دەوروبەری دەمەشق ملکی ئەیووب بوو. لەوێ هەزار سەرِ مەڕی بوو لەگەڵ شوانەکانیان، پێنسەد جووت گای نێر کە هەر جوتێك بەیوغێکەوە بەستڕابابوونەوە و هەرکام کۆیلەیەك لێی دەخوڕی و هەر کۆیلەیەك ژن و منداڵ و سامانی خۆی لەگەڵدابوو. ساز وبەرگی هەر جووت گایەکی نێر، ماکەرێك هەڵیدەگرت لەگەڵ یەك یاچەندین بەچکە. کاتێك ئیبلیس دێوەکانی خۆی کۆکردەوە، بەوانی وت: ئەوەی هێز و زۆرتان هەیە نیشانی بدەن چوونکە منیان بەسەر سامانەکەی ئەیووبدا زاڵ کرد. هەر کام لەوان قەسەیەکی کرد. هەموویانی نارد و هەموو سامانەکانی ئەویان لەناو برد بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا ئەیووب وەسفی گەورەیی خوای دەکرد و لەهەوڵدان بۆ سوپاس کردن و پەرەستنی خوا لەجووڵە نەدەکەوت. خوای سپاس دەکرد کەئەو هەموو سامانەی بەو داوە و داوای خۆراگری دەکرد تا لەبەرابەر کێشەکان بەرگە بگرێت.

کاتێك ئیبلیس بەمشێوەی بینی، داوای لەخوا کرد ئەو بەسەر منداڵەکانی ئەییوبدا زاڵ بکات. خوا ئەوەی بەسەر منداڵەکانی ئەیووبدا زاڵ کرد بەڵام زاڵ بوون بەسەر جەستە و دڵی ئەیووبی پێنەبەخشی. هەموو منداڵەکانی ئەییوبی لەناو برد. ئەوسا لەروخساری ئامۆژگاری منداڵەکانی ئەیووب کە زانستی فێر دەکردن، رۆشتە لای ئەیووب و خۆی بە بریندار وداغدار نیشاندا و بەسەرهاتی مەرگی منداڵەکانی بۆ گێرایەوە تا دڵی ئەیووب نەرم بکات. ئەیووب دڵی نەرم بوو و دڵی سووتا. گریا و مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەریا و ئیبلیس لەم کارە شادمان بوو.

ئەوسا ئەیووب لەکارەکەی پەشیمان بوویەوە و هەوڵیدا و داوای لێبوردنی کرد و فریشتەکان پێش ئیبلیس گەڕانەوەی ئەویان بۆ لای خوا بەرزکردەوە. لەبەر ئەوەی ئەیووب لەپەرەستنی خوا و خۆراگری بۆ تاقی کردنەوەی خوای گەورە نەوەستا،

ئیبلیس داوای لەخوا کرد ئەو بەسەر جەستەی ئەیووبدا زاڵ بکات. خوا ئەوی بەسەر جەستەیدا زاڵ کرد جگە لەدڵ و زمان و عەقڵی کەئیبلیس دەستی پێی رانەگەشت. ئیبلیس رۆشتە لای ئەیووب. لە نوێژدا بوو و سەری لەسوجدەدا. فووی کردە لوتی بەشێوەیەك جەستەی سووتا و گۆشتی جەستەی رزی و هەڵوەری و پڕ لەکرم بوو. ئەگەر کرمێك لەجەستەی بکەوتایەتە خوارەوە ئەیووب هەڵیدەگرت و دەیخستە شوێنەکەی خۆی و دەیوت: لە رۆژی خواوەند بخۆ. توشی گوولی بوو. لەوە خراپتر ئەوەی لەجەستەی دومەڵەکان دەهاتنە دەر بەگەورەیی مەمکی ژنان و دواتر دەتەقین. جەستەی ئەو دارزا بەوشێوەی هیچ کەس توانای بەرگەگرتنی بۆگەنەکەی ئەوەی نەدەهێنا و خەڵك ئەویان بۆ شوێنی خۆڵ رشتنی دەرەوەی گوندەکە دوور خستەوە و جگە لەهاوسەرەکەی کەس لەو نزیك نەدەکەوتەوە. ژن دەهاتە لای و نیازەکانی بەراوەردە دەکرد. حەوت ساڵ لەو شوێنەدا لەسەر زەوی کەوت بەڵام داوای لەخوا نەکرد بەلاّ و زیان لەو دوور بکاتەوە. لەسەراسەری زەوی کەسێك لەسەر زەوی لای ئەو رێزدارتر لای خوا نەبوو.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری تاقی کردنەوی بەم شێوە بوو کە سەرزەوی شام وشکەساڵی دایگرت و فیرعەون کەسێکی بۆ لای ئەیووب نارد: وەرە لای ئێمە، رێگە چارەت هەیە. ئەو لەگەڵ بنەماڵە و کەسان و خزمەکانی خۆی ونەسب و ئاژەڵەکانی بەرەو سەرزەمینی فیرعەون بەرێکەوت و فیرعەون زەوی بەربلاّوی بۆ جوتیاری و ئاژەڵداری پێ بەخشی. ئەوسا شوعەیبی پێغەمبەر د.خ) هاتە لای فیرعەون و وتی: یا فیرعەن ئایا ناترسیت خوا تورە بێت و لە تورەیی ئەو ئاسمان و زەوی و دەریا و کێوەکان بێنە خرۆش؟ ئەیووب بێدەنگ بوو و هیچ قسەیەکی بۆ پشتیوانی شوعەیب نەکرد. کاتێك هەردووکیان رۆشتنە دەر خوا وەحی بۆ ئەیووب نارد: ئەی ئەیووب، لەسەرکۆنە کردنی فیرعەون بێدەنگ بوویت چوونکە لەسەرزەمینی ئەودا بوویت. ئامادەی تاقی کردنەوە بە. ئەیووب وتی: ئایا دڵدانەوەی منالە بێ باوکەکانم نەدەدایەوە، ئایا بێ پەناکانم پەنا نەدەدا، برسیەکانم تێرنەدەکرد و ژنە بێمێردەکانم بێ نیاز نەدەکرد؟ لەم کاتەدا هەورێ لەوێوە تێپەری کە لێوەی دە هەزار ئاوازی هەورە بروسکە

دەبیسترا و هەمووان دەیانوت: یا ئەیوب، کێ ئەم کارانەی کرد؟ ئەیووب مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەریدا و وتی: هەموو ئەو کارانەم بەهێزی تۆ کرد ئەی خوایە کەواتە تۆ کردت. خوا وەحی پێ فەرموو: ئامادەی تاقی کردنەوە بە. ئەییووب وتی: دینەکەی من چی لێدێت؟ خوا فەرمووی: ئەو بۆ تۆ رادەگرم. ئەیووب وتی: کەواتە ترسم نییە.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری گرفتار بوونی ئەو شتی تربوو. وتاری ئەم کەسانە هاوشێوەی باسەکەی ئێمەیە.

کاتێك خوا ئەوەی گرفتاری تاقی کردنەوە کرد و بەلا بەسەر ئەودا باری، ژنەکەی پێی وت: تۆ پیاوێکیت خوا دۆعاکەی تۆ وەلام دەداتەوە، داوا لەخوا بکە چاکت بکاتەوە. ئەیووب وتی: حەفتا ساڵ لەخۆشیدا بووین دەبێت حەفتا ساڵیش لەناخۆشیدا بین. سوێند بەخوا ئەگەر من چاك بکاتەوە سەد قامچی لەتۆ دەدەم. دەڵێن: داستانی سوێند خواردنی ئەو بۆ لێدانی سەد قامچی بەمشێوەبوو کە ئیبلیس لەبەردەمی دەرکەوت و وتی: بۆ ئەم بەلایە بەسەر ئێوەدا هات؟ ژن وتی: چارەنوسی خوایی بوو. ئیبلیس وتی: ئەم روبەروبوونەوەی من لەگەڵ تۆ چارەنوسی خواییە، بەدوای مندا بەرێکەوە. ژن بەدوایدا رۆشت و ئیبلیس هەموو سامانەکانی ئەوانی کەلە دۆڵێکدا کۆکردبوویەوە، پێ نیشاندا و وتی: نوێژ بۆ من بکە تا هەموویت بۆ بگەرێنمەوە. ژن وتی: من هاوسەرێکم هەیە دەبێت فەرمان لەو وەربگرم. ژن هاتە لای ئەییوب و ئەوەی لەوەی رویدابوو، ئاگادار کردەوە. ئەیووب وتی: نەتزانی ئەوە دێوبوو؟ ئەگەر باشب بمەوە سەد قامچیت لێدەدەم. ئەوسا ئەیووب ژنەکەی لەخۆی دوور کردەوە و وتی: خواردن و خواردنەوەی تۆ لەمن حەرام بێت و هیچی لێناخۆم. لەمن دوورکەوەرەوە تا نەتبینم. ژن رۆشت و کاتێك ئەیووب بینی ژنەکەی لەخۆی دوور کردۆتەوە و نیتر خواردن و خواردنەوەی نییە و هاورێیەکی بۆ نەماوەتەوە، کەوتە سەر زەوی و نوێژی خوێند و وتی: خواوەندا، بەلا و زیان دایگرتم و تۆ باشترینی باشەکانی (انبیا/٢١/٨٣). پێی وترا، سەر لەسەر زەوی هەڵگرە چوونکە دۆعاکەت وەلام درایەوە. قاچت لەزەوی بدە کە ئەمە ئاوی خۆ شۆردنی تۆیە و

ئەویتریان بۆ خواردنەوەی تۆ (ص:/٣٨/٤٢). لەم کاتەدا خوا روخسار و قیافەی جارانی بۆ گەڕاندەوە.

لەولاوە ژنەکەی وتی: چۆن بەتەنیا بەجێی بێڵم لەکاتێکدا کەسی لای نییە و لەبرسانا دەمرێت یا درندەکان دەیخۆن؟ بۆ لای ئەیووب گەرایەوە و بینی تەندروستە و باش بۆتەوە بەلأم ئەوی نەناسیەوە و سەریسورما لەوەی ئەیووبی نەبینی. لەبەر ئەمە وتی: ئەی بەندەی خوا، ئایا ئەو پیاوە نەخۆشەت نەبینی لێرەدا بوو؟ ئەیووب وتی: ئەگەر ئەو ببینی دەیناسیتەوە؟ وتی: دەیناسمەوە. وتی: من ئەوم و ژن ناسییەوە.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك وتی (بەلأ و زیان منی داگرت) کە کرمەکان بە دڵ و زمانی گەشتن و ترسا لەئەندێشە و بیرکردنەوەی خوا دوور بکەوێتەوە. خوا بنەماڵە و هەموو ئەو شتانەی لەدەستیدابوو، بۆی گەڕاندەوە. دەستەیەك دەڵێن: خۆی ئەوانی گەڕاندەوە. دەستەیەك دەڵێن: خوا ژنەکەی بۆ گەڕاندەوە و لاوی و گەنجیەکەی پێبەخشییەوە و ئەو بۆ ئەیووب بیست و شەش منالی هێنایە دونیا. لەم زەمانەدا خوا فریشتەیەکی بۆ لای ئەیووب نارد کەوتی: خوا بۆ ئەم خۆراگریەت کەتۆی پێ تاقی کردەوە، سلأوت بۆ دەنێرێت. هەستە و برۆ سەر خەرمانی خۆت. ئەیووب رۆشتە خەرمان و خوا هەورێکی نارد کە کووڵەی زێرینی داباراند. هەندێ کات دەبینرا کولەیەك لەخەرمانەکە دەرۆشتە دەر و ئەیووب دوای دەکەوت تا بیگەڕێنێتەوە. فریشتە وتی: ئایا لەوەی لەناو ئەوەدایە تێر نابیت کە بەدوای ئەوانی دەرەوە رادەکەیت؟ ئەیووب وتی: ئەم بەرەکەتەیش لەبەرکەتەکانی خوای منە و لێی تێرنابم.

کاتێك بەلأ بەسەر ئەیووب تێپەری، حەفتا ساڵیتر ژیا و کاتێك باش بوویەوە خوا فەرمانی پێدا چڵێك دارخورما کە سەد لقی بوو هەڵبگرێت و یەك جار لەژنەکەی خۆی بدات تا سوێندەکەی خۆی بەجێبهێنابێت. ئەوەی ئەیووب وتی: خوایە بەلأ منی داگرت، دۆعا بوو نەگلەی و گازندە و بەڵگەی ئەمە ئەم ئایەی قورئانە کەدەفەرمێت:

ئێمە دۆعاكەی ئەومان وەڵام دایەوە (انبیا/٢١/٤٨).

لەدۆعاكانی ئەیووب: پەنا دەبەم بۆ خوا چاوی لەسەر من بێت. ئەگەر چاكە ببینێت دایدەپۆشێت و ئەگەر خراپە ببینێت ئاشكرای دەكات. دەڵێت: هۆكاری ئەم دۆعایە ئەوەبوو سیان لەهاودینەكان و شوێنكەوتوانی ئەو بەناوی یەلدەد و ئەلیفر و سافر بەدوایدا بەرێكەوتن و كاتێك ئەو لەتاقی كردنەوەدا بوو، خۆیان لێ نزیك كردەوە و بەسەختی ئازاریان دا و سەركۆنەیان كرد و وتیان: تۆ تاوانێكت كردووە كەس نەیكردووە و لەبەر ئەمەیە ئەشكەنجە لەتۆ هەڵناگیرێت. وتووێژی شەڕنەنگێزانەی ئەوان درێژەی كێشا و لەم كاتەدا لاوێك كە لەگەڵ ئەواندا بوو، هاواری كرد و وتی: لەقسەكانتان باشترین وتەتان لەبیركرد، لەبەهێزترین و چاكترینی كارەكانی. ئەیووب لەملی ئێوە ماف و رێزی هەیە زیاتر لەوەی ئاماژەتان پێدا. ئایا دەزانن مافی كێتان خواردووە ورێزی كێتان شكاندووە و رەخنە لە چ كەسێك دەگرن؟ ئایا نازان ئەیووب ئەمرۆ پێغەمبەری خوایە و رێزدارترینی ئافرێنراوەكان لای ئەو؟ نەتانزانی و خوا ئێوەی ئاگادار نەكردەوە كە لەكارێك لەكارەكانی ئەو توڕەیە و شتێك لەو رێزەی بەبەندەكانی خۆی دەبەخشێت لەوی وەرنەگرتۆتەوە. هەروەها ئەیووب بەدرێژایی ئەو زەمانەی لەگەڵێدابوون جگە لەكاری راست و چاكە هیچیتری نەكردووە و جگە لەوتەی راستی نەهێناوەتە سەرزمان. ئەگەر بەلا بۆتە هۆی ئەوەی لەبەرچاوی ئێوەدا سووك بێت و لەبەر چاو و دڵتان كەوتووە، باش دەزانن خوا بەردەوام پێغەمبەرەكان و راستكاران و گیانبازانی و شیاوەكانی خۆی گرفتاری تاقی كردنەوە دەكات و تاقی كردنەوەی ئەوان نیشانەی توڕەیی یا سوك بوونی ئەوان لای خوا نییە بەڵكو هۆكارێكە بۆ رێز گرتن لەوان.

لەم شێوە قسانەی زۆر كرد.

دواتر زیادی كرد ئەگەر دەكەوتنە بیری شكۆ و مەزنی خوا و بیری مەرگتان دەكردەوە، زمانەكانتان لاڵ دەبوو و دڵتان دەشكا و بەڵگەكانتان لەیەك دەپچڕا. ئایا نازانن خوا ئەو بەندانەی هەیە كەترس لەو، ئەوانی لەئاخاوتن دوور خستۆتەوە بێ

ئەوەی لەقسە کردن سست و یا لە گفتوگۆ ناتەوان بن؟ ئەوان فرەزانان و زاناکان و ئاگاکان لەخواوەند و نیشانەکانی ئەون. بەڵام چوونکە ئەوان گەورەیی خوا بیر دێننەوە، دڵەکانیان دەشکێت و زمانەکانیان سست دەبێت و عەقڵیان دەپەرێت و ئەندێشەکانیان لەترسی خوا دەشەڵژێت. کاتێك دێنە هۆش، بەکاری چاکە بەرەو خوا دەڕۆن، خۆیان لەستەمکاران دەژمێرن هەرچەندە لەچاکەکانن، لەگەڵ گوناحکاران خۆیان بەهاوسەنگ دەزانن هەرچەندە وشیارن و خۆپارێز بەڵام ئەوان هەرچی زیاتر بۆ خوای گەورە هەوڵ بدەن بەکەمی دەزانن و کەم بۆ ئەو بەهیچ دەزانن. کارە چاکەکانی خۆیان لەبەرابەر خوا لەبەرچاو ناگرن بەڵکو لەهەر شوێنێك و لەهەر کاتێك ئەوان ببینن ترساو سەرلێشێواون.

کاتێك ئەیووب قسەکەی ئەوەی بیست وتی: خوا زانستی خۆی بەخۆشەویستی خۆی لە دڵی ورد وگەورەدا دەچێنێت و هەرچی لەدڵدا بێت، دێتە سەرزمان. حیکمەت نە لەتەمەن و پیری بەدەست دێت نەلەدرێژایی تاقی کردنەوە. کاتێك خوا بەندەیەك لەمناڵییەوە فەرزان پەروەدە بکات، پێگەی ئەو لای فەرمانڕەواکان دەلەرزێنێت. ئەوسا روی کردە ئەو سییانە وتی: ترسان پێش ئەوەی ئێوە بترسێنن و گریان پێش ئەوەی لێتان بەن. ئێوە چیتان لێدێت ئەگەر پێتان بڵێم سامانی خۆتان لەرێگای خوادا ببەخشن رەنگە خوا من لەم بەڵایە رزگار بکات یا بڵێم قوربانییەك بێنن رەنگە خوا لەمنی وەربگرێت و رازی بێت. ئێوە هەڵخەڵەتاون و گومان دەکەن بەچاکەکاری خۆتان لەبەلا و زیان دوورکەوتونەتەوە. ئێوە سنورتان بەزاند و خۆتان بەرێزدار هەژمار کرد. ئەگەر قسەی راست ببیستن و بەباشی لەپەیوەندییەکانی خۆتان و خوا بڕوانن، ئیرادی زۆر لەخۆتانا دەبینن کە خوا بەجڵ و بەرگی بەختەوەری داپۆشیوە. من لەرابردوودا بەو شێوە بووم خەڵك رێزیان لێدەگرتم و باوەڕیان بە قسەکانی من دەکرد. مافی من ناسراو و دادی من لەدوژمن سەندراو. ئەمرۆ بەو شێوەم نە دەنگم هەیە بۆ وتن و نەفسەیەك بۆ بیستن و نەوتارێك تا بمەوێت لەگەڵ ئێوەدا باسی بکەم. ئێوە لەو ئازارەی خوا بۆی ناردوو بە ئازارترن.

پشتی تێکردن و سەری بۆ دەرگای خوا بەرز کردەوە. داوای هاوکاری لێکرد و

لەبارەگای ئەو دەستی بەگریان کرد. وتی: خوایە، بۆ منت نافڕاند؟ خۆزگە ئەگەر دوژمنم دەبوو، دروستت نەدەکردم. خۆزگە پەڵەیەك خوێن دەبووم و لەدایك دەرژام. خۆزگە گوناحەکەی خۆم دەزانی و ئاگادار دەبووم لەوەی بۆ روی خۆشەویستیت لەمن دوور خستۆتەوە. ئایا ئەگەر منت دەمراند بۆم باشتر نەبوو. ئایا بۆ بێ کەسان ماڵ، بۆ هەژاران حاڵ، بۆ بێ باوکان باوکێکی دادپەروەر و بۆ بێوەژنان سێبەری سەر سەر نەبووم؟ خوایە بەندەیەکی سووك و لاوازم. ئەگەر باشە دەکەم بە هێزی تۆ دەیکەم و ئەگەر خراپەدەکەم سزا لە تۆ وەردەگرم. منت گیرۆدەی بەلا کرد و زیانت پێ بەخشیم کە ئەگەر بە سەر کێوا دائەبەزاند لەهەڵگرتنی ناتەوان دەبوو. من بەم سستی و لاوازییە چۆن دەتوانم بەرگەی بگرم؟ سامانم رۆشت و دەستی نیازمەندیم درێژ کرد. کەسانێك خواردنیان بەمندا کەخواردنم بەوان دابوو. تیکەیەك بەمن دەدەن و منەتەم بەسەردادەکەن و سەرکۆنەم دەکەن. مناڵەکانم لەناوچوون و ئەگەر یەکێك لەوان دەما هاوکاری دەکردم. بنەماڵەکەم لێم وەرێز بوون، خزم و کەس و کار لەمن دابڕاون. ئاشناکان خۆیان بەنائاشنا دەزانن، هاورێکان پشتیان تێکردووم، مافەکانم پێشێل کراون و چاکەکانم لەبیرچوونەتەوە. هاوار دەکەم و وەڵامم نادەنەوە و داوای لێبووردن دەکەم و لە من خۆش نابن. کۆیلەی خۆمم بانگ کرد و وەڵامی نەدامەوە و لای دایکم گریام بەڵام گوێی لێنەگرتم. چارەنوسی تۆ بوو منی ئازاردا و لاوازی کردم و فەرمانی تۆ بوو منی نەخۆش خست. ئەگەر خوا ترس لەدڵم دوور بخاتەوە و زمانم بکاتەوە تا بە دەمی پڕ قسە بکەم - و ئەوسا لەسەر بەندەکان ڕەوای بکات لەگەڵ گەورەی خۆیان بەڵگەیان هەبێت -هیوادارم من لەم کارە ببەخشێت. بەڵام ئەو منی دابەزاند و خۆی بۆ شوێنێك بەرز بوویەوە. من دەبینێت بەڵام من ئەو نابینم. قسەی من دەبیستێت بەڵام من قسەی ئەو نابیستم. نە بەخۆشەویستییەوە لێی روانیم و نە لام ژیا تا وتەیەك لە بێ گوناحی خۆم بێنمە سەرزمان و خۆم بە بەرگرینامەیەك بەهێز بکەم.

کاتێك ئەیوب قسەی گەیاندە ئێرە، هەورێك دەرکەوت و سێبەری خستە سەر و ئاوازێکی لێبیست: خوا دەفەرمێت: یا ئەیووب، لەتۆ نزیك بوومە و بەردەوام لێت

نزیك بووم. هەست و بەڵگەی خۆت بێنەرەوە و بێ گوناحی خۆت بسەلمێنە. لەپێگەی زۆردارێك بێستە چوونکە شیاو نییە جگە لەزۆردارێك لەگەڵ من بەبەڵگەوە قسە بکات. دەمبێن لەدەمی شێر دەدەمیت و هەوسار لەدەمی نەژدیها. رووناکی بە شایەن هەڵدەسەنگێنیت و با بەپێوانە دەپێوی. خۆر دەکەیتە ناو هەنبانەوە و هەنگاو لەرێگەی گەڕانەوە بۆ دوێنێ هەڵدەگریت. گیانی تۆ بەلایەکی بەسەر تۆدا هێناوەکە بەو کەمە هێزەی خۆت ناتوانی هەڵیبگریت. ویستت بەلاوازی خۆت روبەرووی من ببیتەوە یا بە مانی لاڵی خۆت من بێدەنگ بکەیت یا بەهەڵیت و پڵیتەکانی خۆت زاری وتوویژ بەمن بدۆرێنیت. ئەو رۆژەی زەویم ئافراند لەبەرابەر مندا چی بوویت؟ ئایا دەزانی بە چ هێزێك ئافراندم و سەقامگیرم کرد؟ تۆ لەکوێ بوویت ئەوساتەی ئاسمانم وەك سەقفێك بێ کۆڵەکە لەهەوادا راگرت؟ ئەرشتەیەك هەیە بەشوێنێکەوە ببیەستێتەوە و نەکۆڵەکەیەك لەسەر پێ رایبگرێت. ئایا عەقڵی تۆ دەگاتە ئەو شوێنەی رووناکی تیا دروست بکەیت یا ئەستێرەکان لەناویدا بسورێنیت و یا شەو و رۆژی تیا تێکەڵاو بکەیت؟

ئەو هەورە لەهێز و ئافرێنراوەکانی خوا قسەی زۆری کرد.

ئەیووب وتی: لەهەمووی ئەمانە کەمتر و کورتترم. خۆزگە زەوی قەڵشتی دەبرد و منی تیا رۆدەچوم و وتەیەك کە تۆی تورە دەکرد نەمدەهێنایە سەر زمان. خوایە، بەلا دەوری گرتم و دەزانم هەمووی ئەوەی ئامازەت پێدا، دروست کراوی دەست و پەروەردەی هێزی تۆ و چارەنەندێشی فرمزانی تۆیە. تۆ هیچ شتێك ناتەوانت ناکات و هیچ شتێك لەتۆ داپۆشراو نابێت. تۆ ئەوەی لەناو دڵەکاندایە، دەیزانیت و لەبەلاکەی من شتی زۆرت دەزانی کەخۆم نەمدەزانی. من لەهێزی لەپێشی تۆ هەندێ شتم لەرێگەی بیستنەوە دەزانی بەلام ئێستا بەچاویش دەیبینم. ئەوەی وتم بۆ ئەوە بوو داوای لێخۆشبوونی من وەربگریت و تۆ بێدەنگ بوویت تا خۆشەویستی خۆت بۆ من بگەرێنیتەوە. ئێستا دەست دەخەمە سەر دەمی خۆم و زمان بە دیان دەگەزم و روخسار دەخەمە سەر خاك و کۆڵمی خۆمی تێدەسوم. ئیترکارێك ناکەم تۆ بەناپەسەندی بزانیت.

ئەیووب ئەمەی وت و لە خوا پاڕایەوە.

خوا فەرمووی: یا ئەیووب فەرمانەکەی من بەسەر تۆ سەپا و خۆشەوێستیم پێش تورەییم کەوتەوە. تۆم بەخشی و سامانەکەی تۆ وەك خۆی دەگەڕێنمەوە تا بۆ داهاتووانی تۆ نیشانە بێت. بۆ ئەوانەی بەڵایان بینیوە وانەیەك و بۆ خۆراگران دڵدانەوەیەك. ئێستا قاچ لەزەوی بدە کەناوێکی سارد و فێنك بۆ خۆشۆرین و خواردنەوەیە (ص/٤٢/٣٨). لەم ناوەدا هۆکارەکانی باش بوونەوەی تۆ هەیە. بۆ هاورێکانت قوربانی بکە و داوای لێبووردنیان بۆ بکە کە لەئازاردانی تۆ گوناحیان کرد و دەستیان بۆ نافەرمانی کردنی من درێژ کرد.

ئەیووب قاچی لەزەویدا و کانییەکی لێهەڵقولا و خۆی تیا شۆرد و خوا بەلای لەسەر ئەو هەڵگرت. ئەوسا هاتەدەر و دانیشت. ژنەکەی هات و پرسیاری ئەیوبی کرد. ئەیووب وتی: ئایا ئەو دەناسیت؟ ژن وتی: بەڵێ، بۆ نەیناسم؟ ئەیووب بزەیەك کەوتە سەر لێوی و ژن بەهۆی پێکەنینەوە ناسییەوە. ئەوی گرتە ئامێز و لەئامێزی خۆیدا رایگرت. هەموو سامان و منداڵەکانی بۆ گەڕایەوە.

بۆیە لێرەدا ئاماژەم بە داستانەکەی ئەودا چوونکە دەستەیەك کەس دەڵێن ئەو لەرۆژگاری یەعقوبی پێغەمبەردا بووە.

دەڵێن: تەمەنی ئەیووب ٩٣ ساڵ بووە و لەکاتی مردنی، کورەکەی، حوملی کردە جێگری خۆی. خوا دوای ئەو، کورەکەی، بەشرینی بۆ پێغەمبەری هەڵبژارد و ناوی نا ذوالکفل بوو و لەشام مایەوە تا کاتی مردن. تەمەنی ئەو ٧٥ ساڵ دوای خۆی کوڕەکەی عەبدوڵڵەی کردە جێگری خۆی. خوا دوای ئەو پێغەمبەرێکی دیکەی ڕەوانە کرد:

شوعەیب کوڕی زەیعون کوڕی عەنقا کوڕی سابت کوڕی مودەیەن کوڕی ئیبراهیم .

## داستانی یوسف

دەڵێن ئیسحاق لە ١٦٠ ساڵیدا مرد. ئارامگای ئەو لای ئارامگای باوکی ئیبراهیمە و دو کوڕەکەی یەعقوب و عەیس ئەویان لەکێڵگەی جیبروون بەخاك سپارد. تەمەنی یەعقوب ١٤٧ ساڵ بوو. کورەکەی یوسف نیوەی جوانییەکەی لەباوکی بۆ بەجێمابوو و نیوەکەیتری لەدایکی. یەعقوب ئەوەی بەدەست خوشکەکەی خۆی ، کچەکەی ئیسحاق، سپاردبوو. پوور بەتەواوی دڵیدا بە کوری براکەی خۆی و یوسف بە تەواوی پوورەکەی خۆی خۆشدەویست. جارێك یەعقوب بەخوشکەکەی خۆی وت: خوشکەکەم یوسف بەمن بسپێرە چوونکە سوێند بە خوا بێ ئەو ناتوانم بژیم. خوشك وتی: با ئەو چەند رۆژێك لای من بێت رەنگە ئەمە ببێتە هۆی ئارامی من. ئەوسا ئەو ژنە پشتێنەکەی ئیسحاقی هەڵگرت و لە پشتی یوسفی بەست (کە لای ئەو بوو، چوونکە ئەو گەورەترین منالّی ئیسحاق بوو) دواتر وتی: پشتێنەکە ون بووە، بزانن کێ هەڵیگرتووە. چەند کەسێك بەدوای پشتێنەکەدا گەڕان و خوشکەکەی یەعقوب وتی: کەسانی ناو ماڵ بگەرێن. ئەوان گەڕان و پشتێنەکەیان لای یوسف دۆزییەوە. لەئایینی ئەواندا بەم شێوە بوو خاوەن ماڵ دزی دەگرت( لای خۆی رایدەگرت و بەئەگەری زۆر دەیکردە کۆیلەی خۆی) و هیچ کەس لەم کارەدا دژایەتی نەدەکرد. ئەو ژنە یوسفی هەڵگرت و لای خۆی رایگرت تا ئەوساتەی مرد و دواتر یەعقوب ئەوی گەڕاندەوە بۆ ماڵ. ئەمە ئەو شتە بوو دواتر براکانی یوسف باسیان کرد و وتیان: ئەگەر بنیامین دزی کردبێت براکەیشی یوسف پێشتر ئەم دزییەی کردووە (یوسف/١٢/٧٧). لەبارەی دزییەکەی ئەو ئاماژەیان بەبابەتی تریش داوە کەئاماژەدان پێیان پشت گوێ خراوە.

کاتێك براکانی یوسف خۆشەویستی و سەرنجی باوکیان بۆ یوسف بینی، رژدیان پێبرد و ئەم کارەیان لا گران بوو. یوسف لەخەودا بینی یانزە ئەستێرە بەخۆر و مانگەوە نوێژی بۆ دەبەن. خەوەکەی خۆی بۆ باوکی گێرایەوە و تەمەنی لەم کاتەدا دوانزە ساڵ بوو. باوك پێیوت: کورم خەوەکەی خۆت بۆ براکانت مەگێرەرەوە نەکا فرێوت بدەن چوونکە دێو بۆ مرۆڤ دوژمنێکی ئاشکرایە (یوسف/١٢/٥). یەعقوب خەوەکەی

بۆ لێکدایەوە و وتی: بەمشێوەیە خواکەت تۆ هەڵدەبژێرێت و چۆنییەتی کردنەوەی نهێنییەکانت فێردەکات (یوسف/١٢/٦).

هاوسەرەکەی لەوتەکانیان ئاگادار بوویەوە. یەعقوب پێی وت: ئەی ژن، ئەوەی یوسف وتی، با نهێنی بێت و بەمناڵەکانی خۆت مەڵێ. وتی: نهێنی دەبێت. بەلام کاتێك مناڵەکانی یەعقوب لەشوانی گەڕانەوە بۆماڵ، خەوەکەی یوسفی بۆ ئەوان گێڕایەوە و لەبەر ئەمە رژدی بردنی ئەوان بۆ یوسف زیادی کرد. ئەوان بەم ژنەیان وت: ئەو لەخۆر جگە لەباوکمان و لە مانگ جگە لەتۆ و لە ئەستێرەکان جگە لەئێمەی نەبیستووە. کوری راحیل دەیەوێت سەروەری ئێمە بکات و بڵێت سەروەری ئێوەم. لەنێوان خۆیاندا راوێژیان کرد و بڕیاریاندا یوسف و یەعقوب لەیەك دوور بکەنەوە. بەیەکیان وت: یوسف و بنیامین لەئێمە لای باوکمان خۆشەویست تر و رێزدارترن و ئێمە دەستەیەکین دەکەس. باوکی ئێمە لەم خۆشەویستیەدا لە گومراییدایە و دەستی بۆ کارێکی هەڵە بردووە کە ئەو دووانەی پێش ئێمە خستووە. یوسف بکوژن یا بۆ سەرزەوینێکی دوور، دووری بخەنەوە تا روی باوك و خۆشەویستییەکەی بۆ ئێوە بگەرێتەوە و ئێوە دوای ئەمە چاکەکار بن (یوسف/١٢/٨—٩). و بۆ لای خوا بگەرێنەوە.

بێژەرێك لەوان کە یەهودا بوو و باشترین و عاقڵترینیان بوو، وتی: یوسف مەکوژن چوونکە کارێکی دژوارە بەڵکو بیخەنە ناو چاڵێك تا کاروانیان هەڵیبگرنەوە (یوسف/١٢/١٠). ئەو بەڵێنی لێوەرگرتن کەیوسف نەکوژن. لەم کاتەدا هاوڕا بوون برۆنە لای یەعقوب و قسەی لەگەڵدا بکەن تا یوسف لەگەڵ ئەوان بۆ دەشت و بیابان بنێرێت. ئەوان رۆشتنە لای و لەبەرامبەریدا وەستان - ئەمە کارێك بوو بەردەوام لەکاتی پێشکەش کردنی داواکاری دەیانکرد- کاتێك یەعقوب ئەوانی بینی وتی: داواکاریتان چییە؟ وتیان: ئەی باوکە، تۆ چیت بەسەر دێت وا یوسف لەئێمە دوور دەخەیتەوە هەرچەندە ئێمە چاکەی ئەومان دەوێت. ئەو دەپارێزین تا بۆ ماڵەوەی دەگەرێنینەوە. بەیانی لەگەڵمان بینێرە بۆ دەشت، ئێمە مەرومالات دەلەوەرێنین و ئەو بۆ خۆی گەمە بکات و ئێمە پاسەوانین بۆی (یوسف/١٢/١١—١٢). یەعقوب پێی

وتن: خەم دامدەگرێت کاتێك ئەو لەگەڵ خۆتاندا دەبەن و دەترسم گورگ بیخوات و لێی بێ ئاگا بن (یوسف/١٢/١٣). و نەزانن چی بەسەر ئەودا هاتووە. بۆیە ئەوەی وت چوونکە لەخەودا بینیوبووی یوسف لەسەر کێوێکە و دە گورگ هێرشیان کردۆتە سەر تا لەت و پەتی بکەن. یەکێك لەگورگەگان پشتیوانی لێکرد و لەم کاتەدا زەوی قەڵەشتی برد و یوسف تیایدا رۆچو و نەهاتەدەر مەگەر دوای سێ رۆژ. لەبەر ئەمە لەگورگ بۆ گیانی یوسف دەترسا.

کوڕەکان پێیان وت: ئەگەر گورگ ئەو بخوات (ئێمە دەستەیەکی دە کەسین) لەم کاتەدا هەموومان لەتاوانبارانین (یوسف/١٢/١٤). یەعقوب بەمە نارامی گرت و یوسف وتی: باوکە من لەگەڵ ئەواندا بنێرە، ئایا بەمە رازی نیت؟. وتی رازیم؟ دەستوری بەودا و جل و بەرگی لەبەر کرد و لەگەڵ ئەوان رۆشت و ئەوان (تا ئەو کاتەی چاوی یەعقوب دەیبینی) رێزیان لێدەگرت. کاتێك گەشتنە دەشت، دوژمنایەتیان لەگەڵ ئەو ئاشکرا کرد بەشێوەیەك هەرکامیان لێی دەدا. یوسف پەنای دەبردە ئەویتر و ئەویش لێی دەدا. چیتر لەناو ئەوندا برایەکی میهرەبانی نەدۆزییەوە. ئەوەندەیان لێیا نزیك بوو لەناوی ببەن. یوسف دەیقیژاند: ئەی باوکە گیان، بروانە ئەم کەنیز زادانە لەگەڵ کورە خۆشەویستەکەی تۆ چی دەکەن.

کاتێك نزیك بوو بیکوژن، یەهودا پێی وتن: ئایا بەڵێنتان بەمن نەدا نەیکوژن؟ ئەوان بردیانە سەر چاڵی ناوەکە و شانەکانیان بەستەوە و کراسەکەیان داکەند و فڕیان دایە ناو چاڵەکە. یوسف وتی: ئەی برا خۆشەویستەکانم، کراسەکەم بەمن بدەنەوە تا لەناو چاڵەکە خۆمی پێ داپۆشم. وتیان: خۆر و مانگ و یانزە ئەستێرەکە بانگ بکە تا ببنە هاودەمی تۆ و لەتەنیایی رزگارت بکەن. وتی: خەوی لەو شێوەم نەبینیوە. ئەویان بۆ ناو چاڵەکە شۆر کردەوە و کاتێك گەشتە نیوە، بەرەڵایان کرد چوونکە دەیانویست بمرێت بەڵام لەبەر ئەوەی چاڵەکە پڕناو بوو، کەوتە ناوی و دواتر پەنای بردە تاشە بەردێك و رۆشتە سەری. بانگیان کرد، گومانی کرد بەزەییان پیایدا هاتۆتەوە بەڵام ئەوان دەیانویست بەردی بۆ فرێبدەنە خوار کەیەهودا رێگەی لەم کارە گرت.

خوا وەحی بۆ یوسف نارد: بێ گومان رۆژێك لەرۆژەكان ئەوان لەكارەكانیان ئاگادار دەكاتەوە بەشێوەیەك ئەوان هەست بەنهێنییەكەی نەكەن (یوسف/١٢/١٥). یانی ئەوان نهێنی وەحی نازانن یا لەو رۆژەدا (لەداهاتوودا)یوسف ناناسنەوە.

شەو بە دەم گریانەوە گەڕانەوە بۆ لای باوكیان و وتیان: ئەی باوكە، ئێمە رۆشتین بۆ تیرهاویشتن و یوسفمان لای جل و بەرگەكانی خۆمان دانا و گورگ ئەوی خوارد(یوسف/١٢/١٧). باوك پێی وتن: بەو شێوە نییە، بەڵكو جەستەكانی ئێوە كارێكی بۆ دروست كرد. كراسەكەی نیشانی من بدەن. ئەوان كراسەكەیان نیشاندا. یەعقوب وتی: گورگێكی میهرەبانتر لەمەم نەبینیوە، كوڕەكەمی خواردووە بەڵام كراسەكەی نەدراندووە. ڤیزاندی و كەوتە سەر زەوی و بێ هۆش بوو و بۆ ماویەك لەو حاڵەدا مایەوە. كاتێك هاتە هۆش، زۆر گریا و كراسەكەی گرت و ماچی كرد و بۆنی كرد.

یوسف سێ رۆژ لەچاڵەكەدا مایەوە. خوا فریشتەیەكی نارد و دەستەكانی ئەوی كردەوە. كاروانێك هات و مەشكی خۆیان بۆ ناو ناردە خوار، یوسف خۆی پێ هەڵواسی و ئەو پیاوە بەرزی كردەوە و وتی: ئەی هاوار(لەخۆشیا) كوڕێك لەچاڵەكە هاتەدەر. ئەویان داشارد و وەك كاڵا لەقەڵەمیاندا (یوسف/١٢/١٩). ئەو كەسەی بەرزی كردەوە لەگەڵ هاورێكانی ئەویان داشارد تا كەسانی دیكە نەڵێن ئێمە لەمەدا بكەنە شەریك. بەهاورێكانیان وت: خاوەندەكانی ناو ئەم كوڕەیان وەك كاڵایەكی بازرگانی بەئێمەدا.

یەهودا خورادنی بۆ یوسف هێنا بەڵام ئەوی لەناوچاڵەكەدا نەبینی و كاتێك ڕوانی ئەوی لای كاروانەكە بینی و براكانی لەم كارە ئاگادار كردەوە. براكان رۆشتنە لای ئەو پیاوە و وتیان: ئەم بەندە هەڵاتووە هی ئێمەیە. یوسف لەوان ترسا وبەسەرهاتی خۆی باس نەكرد و كاروانیان ئەویان بەبەهایەكی كەم لەبراكانی كڕییەوە. دەستەیەك دەڵێن بیست درەم ودەستەیەك دەڵێن چل درەم. ئەوان یوسفیان بردە میسر و خاوەنەكەی جل وبەرگی لەبەر كرد و بەمەبەستی فرۆشتن نیشانی

خەڵکانیدا. قۆتفیر یا ئۆتفیر کە بەوتەی قورئان هەمان عەزیزە، ئەوی کڕییەوە.

عەزیز خەزێنەداری میسر بوو. پاشای میسر لەم سەردەمەدا ریان کوڕی وەلید پیاوێك لە عەمالاقان بوو. دەڵێن: ئەم پاشایە نەمرد تا باوەڕی بەیوسف هێنا. ئەو مرد و یوسف زیندوو بوو. دوای ئەو قابووس کوڕی مەسعەب پاشایەتی گرتەدەست. یوسف بۆ خواپەرەستی هانیدا بەڵام باوەڕی نەهێنا.

کاتێك ئەو پیاوە یوسفی کڕییەوە و بردییەوە ماڵ، بەژنەکەی (راعین) وت: رێز لەم لاوە بگرە رەنگە سوودمان پێ ببەخشێت و کاتێك گەشە بکات و گەورە بێت و هەست بەکارەکانی ئێمە بکات هاوکارمان بێت یا ئێمە وەك منالّی خۆمان هەڵیگرینەوە (یوسف/٢١/١٢). ئەو پیاوە لەگەڵ ژنان تێکەڵاو نەدەبوو. راعین ژنێکی جوان و ئەندام رێك و سامانێکی زۆری لەبەردەستا بوو.

کاتێك لەژیانی یوسف سی و سێ ساڵ تێپەری، خواوەند زانست و حیکمەتی فێرکرد و ئەمە پێش پێغەمبەری ئەو بوو. ژنی عەزیز یانی راعیل ئەوەی بۆ لای خۆی بانگ کرد و درگاکانی لەسەر ئەو و خۆی داخست و بانگی کردە پێش. یوسف وتی: پەنا بەخوا، هاوسەری تۆ گەورەی منە و رێزی لەمن گرتووە. ستەمکاران رزگاریان نابێت (یوسف/٢٣/١٢). مەبەستەکەی ئەوە بوو دەست بردن بۆ ئەو ژنە خیانەتە و ستەمێکی گەورەیە. ژن جارێکیتر رویتێکردەوە و جوانییەکانی نیشان کرد تا هەستی ببزوێنێت. وتی: چ قژێکی جوانت هەیە! یوسف وتی: یەکەم شتە لەجەستەم هەڵدەوەرێت. ژن وتی: چاوەکانت زیاد لەرادە جوانن. یوسف وتی: چاوەکانم یەکەم شتە دەکەونە سەر زەوی. ژن وتی: چ روخسارێکی جوانت هەیە! یوسف وتی: کاتێك بمرم دەیخەنە سەر خاك. ژن بەردەوام دەیویست هەستی ببزوێنێت و یوسفیش هەستی بزوا و بەندی شەرواڵەکەی کردەوە. لەناکاو روخساری یەعقوبی بینی کەپەنجەی بەدیان دەگەزێت و دەڵێت: یا یوسف، هاوئامێزی مەبە چوونکە کاری تۆ تا کاتێك هاوئامێزی نەبوویت وەك باڵندەیەکە لەترۆپکی ئاسمان بەڵام ئەگەر هاوئامێزی بیت کاری تۆ هاوشێوەی باڵندەیەکە لەئاسمان بکەوێتەخوار و بمرێت.

دەستەیەك دەڵێن: یوسف لەنێوان دوو ڕانی ژنەکە دانیشت بەڵام لەسەر دیوار نوسراوێکی بینی بەم شێوەیە: لەزینا نزیك مەکەونەوە چوونکە بێ گومان کارێکی قێزەون و ڕێگەیەکی هەڵەیە (اسرا/١٧/٣٢). کاتێك بورهانی خوای بینی، هەستا و رایکرد و ڕۆشت بەڵام ژن پێش لەگەشتنی ئەو بەدەرگا، گرتی و کراسەکەی لەپشتەوە راکێشا و دڕاندی. هەردووکیان هاوسەری ئەو ژنەیان لەناو دەرگاکەدا بینی و کوڕە پورەکەیشی لەگەڵیدا بوو. ژن لێرەدا بابەتەکەی ناوەژۆ کرد وبەهاوسەرەکەی وت: سزای کەسێك نییەتی خراپی بەرابەر بەژنەکەی تۆ هەبێت جگە لەزیندان نییە (یوسف/١٢/٢٥- ٢٦). یوسف وتی: ئەمە راست نییە. ئەم ژنە بوو داوای لەمن دەکرد تێکەڵاوی بم و من رامکرد وئەو کراسەکەمی گرت و دڕاندی. کوڕە پوری ژنەکە پێی وت: بەڵگەی ئەم کارە دەتوانین لەکراسەکە بپرسین. ئەگەر کراسەکە لەپێشەوە دڕا بێت تۆ راست دەکەیت و ئەگەر لەپشتەوە دڕا بێت تۆ درۆ دەکەیت. کراسەکەیان هێنا و بینیان لەپشتەوە دڕاوە و ئەو وتی: ئەم کارە لەفێڵی ئێوە ژنانە و فێڵەکەتان زۆر گەورەیە (یوسف/١٢/٢٨).

دەستەیەك دەڵێن: شایەت، منداڵێکی ناو لانکە بوو. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: چوار کەس لەمنداڵان لەناو لانکەدا قسەیان کرد- کوری ئارایشگەری ژنەکەی فیرعەون، شایەتەکەی یوسف، یاری جورەیج و عیسا کوڕی مریەم.

هاوسەری ئەو ژنە بەیوسفی وت: لەم کارە خۆشبە (یوسف/١٢/٢٩). یانی ئەوەی ئەم ژنە کردی لای کەس باسی مەکە. رویکردە ژنەکەی و وتی: تۆیش داوای لێبووردن لەگوناحەکەی خۆت بکە چوونکە لەخراپەکاران بوویت (یوسف/١٢/٢٩).

ژنانی شار وتوێژیان لەبارەی هاوسەرەکەی عەزیز و یوسف دەکرد. ئەم بەسەرهاتە بە گوێی ژنەکە گەشتەوە. ئەو بانگی کردن و بۆ هەرکام فەرشێکی راخست و پشتی دانا تا پاڵی پێوە بدەن. ئەوان ئامادە بوون. نارنج و کێردی دایە دەستیان. یوسفی لەشوێنێکیتر جگە لەو شوێنەی ئەوان لێی دانیشتبوون، دانیشاند و پێی وت: وەرە لای ئەوان. ئەو هات و کاتێك ژنان ئەویان بینی(جوانتر بوو لەوەی بیستبوویان) دەستی

خۆیان بەکێردەکان بڕی — و ئەمکارەیان نائاگایانە کرد- وتیان: پەنا بەخوا، ئەمە مرۆڤ نییە، ئەمە فریشتەیەکی گەورەیە(یوسف/١٢/٣١).

کاتێك ئەم رووداوە بەسەر ژنان هات و لەهۆش چوون و دەستی خۆیان بڕی و هەستیان بەهەڵەی خۆیان کرد کەنابەجێ قسەیان کردبوو، ژنی عەزیز زمانی بۆ دانپیانان کردەوە وتی: ئەمە ئەو کورەیە منتان لەبەر ئەو سەرکۆنە دەکرد. ئێوە راستتان دەکرد. من ئەوم بۆ لای خۆم بانگ کرد و ئەو خۆی پاراست. ئەگەر ئەوەی دەیڵێم نەیکات، دەکەوێتە زیندان و لە ریسواکان دەبێت (یوسف/١٢/٣٢). یوسف زیندانی هەڵبژارد و نافەرمانی خوای بەخراپتر لەزیندان بینی. وتی: خوایە، زیندان لەوەی ئەوان داوام لێدەکەن، باشترە و حەزم لێیەتی. ئەگەر فێڵی ئەمان لەمن دوور نەخەیتەوە، لێیان نزیك دەبمەوە و لەنەزانەکان دەبم (یوسف/١٢/٣٣). خوا بانگێشتەکەی ئەوەی وەڵامدایەوە و فێڵی ئەو ژنانەی لەو دوورکردەوە، ئەو بیسەری زانایە (یوسف/١٢/٣٤). ئەو نیشانانەی عەزیز بینی- وەك دڕانی کراسەکەی لەپشت و بریندار بوون و ڕوشانی روخسار و بڕینی دەستی ژنان و شایەتی دانی منداڵەکە- عەزیزی دڵنیا کرد لەوەی یوسف بێ گوناح و تاوانە.

دەڵێن: ژن شکایەتی بردە لای هاوسەرەکەی: ئەم کۆیلەیە منی لەناو خەڵکدا ریسوا کرد و بۆ ئەوانی بەم شێوە گێراوەتەوە کەئەوم بۆلای خۆم بانگ کردووە. عەزیز ئەوی خستە زیندانەوە و یوسف حەوت ساڵی لە زینداندا بەسەر برد. کاتێك یوسف کەوتە زیندان، هاورێ لەگەڵ ئەو، دوو لاوی دیکە کەوتنە زیندان. لەهاوەڵانی فیرعەونی میسر بوون. یەکیان سالاری خواردەمەنیەکانی فیرعەون وئەویتریان سالاری مەیخواردنەوە بوو. لەبارەی ئەم دوو کەسە دەڵێن: مەبەستیان بوو پاشا ژەهر خوارد بکەن. کاتێك یوسف کەوتە زیندان، وتی: من خەو لێکدەدەمەوە. یەك لەو دو لاوە بەویتریانی وت: با تاقی بکەینەوە. چێشت لێنەر وتی: لەخەودا بینیم نان بۆسەری خۆم دەبەم و باڵندەکان لێی دەخۆن. ئەویتریان وتی: لەخەودا بینیم گوشراوەی ترێ دەگرم تا شەرابی لێ دروست بکەم. ئێمە لەلێکدانەوەی ئەم خەوانە ئاگادار بکەرەوە چوونکە تۆ لەچاکەکاران دەبینین (یوسف/١٢/٣٦). یوسف وتی: هیچ

خورادنێك بۆ ئێوە نایەت، مەگەر ئەوەی ئێوە لەداستان و چارەنوسەکەی — پێش هاتنی بۆ ئێوە ئاگادار بکەمەوە. ئەمە ئەو زانستەیە خوا فێری کردووم. من پشتم کردە دینی کەسانێك پشتیان کردە دینی خواوەند و بەجێم هێشتن. هەروەها لەدینی ئەوانەی باوەریان بەرۆژی دوایی نییە (یوسف/٣٧/١٢). یوسف پەسەندی نەکرد لەسەرەتادا چارەنوسی خەوەکەی ئەوان لێکبداتەوە. باسی شتێکیتری دەکرد و وتی: ئەی دو هاورێی زیندانی من، ئایا خوا فراوان و بەربلاوەکان باشترن یا خوای تاق و تەنیا؟(یوسف/٣٩/١٢). ناوی چێشتلێنەر (مخلت) و ئەویتریان (نەبو). ئەم دووانە دەستیان لەیوسف هەڵنەگرت تا لێکدانەوەی خەوەکەیان پێبڵێت. یوسف وتی: یەکێك لەنێوە دووانە، یانی ئەوەی بینیویەتی لەخەودا گوشراوەی ترێ دەگرێت، لەزیندان دەردەچێت و بادە بۆ خواوەند دەگێرێت. بەلام ئەویترتان لەدار دەدرێت و باڵندەکان سەری دەخۆن (یوسف/٤١/١٢). کاتێك یوسف لێکدانەوەی بۆ خەوەکەی ئەوان کرد، وتیان: ئێمە هیچمان لەخەودا نەبینی. یوسف وتی: فەرمانی خوا نێردرا سەبارەت بەوەی ئێوە دوکەس پرسیارتان لەبارەوە کرد (یوسف/٤١/١٢). یوسف رویکردە نەبوو - نەبو ئەو کەسەبوو لەنێوان ئەو دووانەدا گومانی ئازادی و رزگار بوونی بۆ دەکرد- وتی: من لای پاشاکەی خۆت بیربێنەرەوە (یوسف/٤٢/١٢). ئەم پاشایە، هەمان پاشای میسربوو. یوسف داوای لەم زیندانییە کرد لەکاتی ئازادبوونی پێشنیاری ئازادی ئەو بە پاشا بکات بەلام دێو بیرهێنانەوەی ناوی ئەوی لای پاشا لەبیر بردەوە و بەم شێوەیە بۆ چەند ساڵێکی دیکە لەزینداندا مایەوە (یوسف/٤٢/١٢).

وتنی ئەم رستەیە ئاگاییەك بوو لە لایەن دێوەوە هاتە سەر زمانی یوسف. خوا وەحی فەرموو: ئەی یوسف، جیاواز لەمن کەسێکی دیکەت کردە پشتیوان، بێ گومان ساڵەکانی زیندانی تۆ درێژدەکەمەوە. لەبەر ئەمە ئەو چەند ساڵێکیتر لە زینداندا مایەوە. پاشای میسر یانی ریان کوری وەلید کوری هاروون کوری ئەراشە کوری فاران کوری لاوز کوری سام کوری نوح، خەوێکی مەترسیداری بینی. لەخەودا بینی حەوت مانگای قەڵەو لەدارێکی خاڵی هاتنە دەر و حەوت مانگا لاغەرەکەی ئەوانیان خوارد کەهیچ زیادبوونێك لەخواردن لەوان دەرنەکەوت و حەوت لاسکی سەوز کە حەوت

لاسکی وشکی لێ بەرزبوویەوە. جادوگەڕان و کاهینان و پێشگۆکان و فالگیرەکانی کۆکردەوە و خەوەکەی خۆی بۆ باس کردن. وتیان: ئەمانە خەوی پرێشان و ئێمە لەلێکدانەوەی خەوی پەرێشان ناتەوانین. لەم ناوەدا یەك کەس لەو دو زیندانییە کەرزگاری ببوو، دوای ماوەیەك یوسفی بیرهێنایەوە و وتی: ئێوە لەنهێنی ئەم خەوە ناگادار دەکەمەوە. من بنێرن (یوسف/١٢/٤٤). ئەویان بۆ لای یوسف نارد. خەوەکەی بۆ باس کرد و پەیامی دانا. یوسف وتی: حەوت ساڵی بەردەوام جوتیاری دەکەن و دەچێنن. هەرچی لێ هەڵدەگرن تۆوەکەی بکەنە ناو لاسکەکەی بەو شێوەی بمێنێتەوە مەگەر کەمێکی کەبۆ خواردنی خۆتان بەکاری دەبەن. دواتر حەوت ساڵی وشك و بێ باران دێتە پێش کە لەماوەی ئەو حەوت ساڵەدا ئەوەی بۆ ئەوان پاشەکەوتتان کردووە لەهەمبار دەهێنن و دەیخۆن مەگەر کەمێکی کەبۆ چاندن هەڵیدەگرن. ئەوسا ساڵێکی بەبەرهەم دێت، باران دەبارێت و ئەوان میوەکان دەگوشن (یوسف/١٢/٤٧—٤٩).لەسەر ئەم بنەمایە، مانگا قەڵەوەکان ساڵەکانی بەبەرهەم و مانگا لاغرەکان ساڵە وشکەکان و بێ بارانەکانن و لاسکە سەوزەکان و لاسکە وشکەکان. ئەبو گەڕایەوە بۆ لای پاشا و ئەوەی ناگادار کردەوە. زانی کەلێکدانەوەکەی یوسف راستە. پاشا وتی: یوسف بۆ لای من بێنن (یوسف/١٢/٥٠). کاتێك نێردراو هات و ئەوی بۆ لای شا بانگێشت کرد، یوسف لەگەڵی نەهاتەدەر بەڵکو وتی: بۆ لای پاشا بگەڕێرەوە و بپرسە: ئەو ژنانە چییان بەسەرهات کەدەستی خۆیان بڕی؟ (یوسف/١٢/٥٠). کاتێك نێردراو لای یوسف گەڕایەوە، پاشا هەواڵی ئەو ژنانەی پرسی: داستانی یوسف لەگەڵ (ژنی عەزیزی میسر)چۆن بوو؟ ژنان وتیان: حاشا وە لیلا، ئێمە هیچ خراپەیەکمان لەیوسف نەبینی (یوسف/١٢/٥١). هاوسەری عەزیز وتی: هەرئێستا راستییەکان ئاشکرا دەبێت. من بووم ئەوم بۆ لای خۆم بانگ دەکرد و یوسف لەراست بێژانە (یوسف/١٢/٥١). یوسف وتی: من نێردراوم بۆیە ناردەوە تا سەروەرم بزانێت بەنهێنی خیانەتم لێنەکردووە و خواوەند فێڵی فێڵبازان ناخاتە سەر رێگەی راست (یوسف/١٢/٥٢). یانی بەنهێنی خیانەتم لەژنەکەی نەکرد. کاتێك ئەمەی وت: جبرەئیل لێی پرسی: تەنانەت کاتێك مەبەستی ئەو ژنەت کرد؟ یوسف وتی: گیانی خۆم بەپاك نازانم چوونکە جەستەی خەڵك فراوان خراپەخواز و

بەخراپە فەرمان دەدات مەگەر ئەو کەسەی خۆشەویستی خوا بەسەریەوە بێت و هەمانا خوا بەخشندە و میهرەبانە (یوسف/١٢/٥٣).

کاتێك پاکی یوسف بۆ پاشا ئاشکرا بوو، وتی: یوسف بۆ لای من بێنن چوونکە دەیکەمە تایبەتمەندترین کەسی خۆم (یوسف/١٢/٥٤). کاتێك نێردراو گەشت، یوسف لەگەڵی هاتەدەر و لەخوا بۆ زیندانیان پارایەوە و لەسەر دەرگای زیندان نوسی: ئێرە گۆڕستانی زیندووەکانە و شوێنی خەم وهۆکاری تاقی کردنەوەی هاورێکان و هۆکاری سەرکۆنە کردنی دوژمنان. خۆی شۆرد و جلّ بەرگی لەبەر کرد و بەرەو لای پاشا بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە لای پاشا و لەگەڵ ئەودا قسەی کرد، پاشا وتی: ئەمرۆکە تۆ لای ئێمە پێگەیەکی بەهێز و جێگیر و پەسەندت هەیە (یوسف/١٢/٥٤). یوسف وتی: وەك سەرپەرەستی گەنجخانەکان دەستنیشانم بکە، پیاوێکی دەست پاك و پارێزەرێکی زانام (یوسف/١٢/٥٥). پاشا دوای یەك ساڵ ئەوەی لەسەر ئەو کارە دانا و ئەگەر خۆی پێشنیاری ئەو کارەی نەدەکرد هەمان سات ئەوەی بۆ ئەو کارە دەستنیشان دەکرد. ئەو خەزێنەکانی خۆی دوای یەك ساڵ بەو سپارد و کاروباری تایبەت هەڵسەنگاندنی خستە ئەستۆی ئەو و فەرمانەکانی بە ڕەوا دەزانی. دوای ئەوەی قەتفیر مرد، پاشا پێگە و کاری قەتفیری بەیوسف سپارد. مەرگی ئەو لەو شەوانەدا بوو. دەستەیەك دەڵێن: بەو شێوە نییە بەڵکو پاشا ئەوی لابرد و کارەکەی بەیوسف سپارد. وتاری یەکەم ڕاسترە چوونکە وەك ئاماژەی پێدەدەین، یوسف ژنەکەی ئەوی ( کە دڵدادەی بوو) بۆ هاوسەری هەڵبژارد.

کاتێك یوسف کاری میسری گرتە دەست، پێشنیاری خواپەرەستی بەپاشا ریان کرد. پاشا باوەری بەخوا هێنا و دواتر مرد. دوای ئەو قابووس کوڕی مەسعەب کوڕی معاویە کوڕی نەمر کوڕی سلواس کوڕی فاران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەملاق بوو بەپاشای میسر و یوسف پێشنیاری خواپەرەستی بەویش کرد بەلاّم باوەری نەهێنا و یوسف لەسەردەمی ئەو مرد.

پاشای میسر ریان، راعیل هاوسەری سەروەری یوسفی کردە هاوسەری یوسف. کاتێك

یوسف لێی نزیك بوویەوە، پێی وت: ئەی ژن ئایا ئەمە باشتر نییە لەوەی تۆ داوات دەکرد؟ ژن وتی: ئەی پیاوی راست بێژ، سەرکۆنەم مەکە، ژنێکی جوان و دەوڵەمەند بووم بەڵام مێردەکەم تێکەڵاو بەژنان نەدەبوو و تۆ جوانییەکی بێ وێنەت لەخواوەندەوە پێبڕابوو. داواکاری جەستەم بەسەرمدا زاڵ بوو. یوسف لێی نزیك کەوتەوە و بینی هێشتا کچە. ئەو ژنە دوو منداڵی بە ناوەکانی ئەفرایم و مەنشا بۆ یوسف هێنایە دنیا.

کاتێك یوسف خەزێنەکانی ئەو وڵاتەی گرتە دەست و حەوت ساڵی بەبەرهەم هات، یوسف لەو ساڵانەدا گەنمی بەلاسکەکانییەوە کۆدەکردەوە و هەڵیدەگرت. ساڵە وشکەکان دەستی پێکرد و خەڵك گرفتاری کەمی و قات وقڕی بوون و سەرزەوینی یەعقوبیش زیانی بەرکەوت. یەعقوب کورەکانی نارد بۆ میسر و بنیامین لای خۆی هێشتەوە. کاتێك هاتنە لای یوسف، یوسف ئەوانی ناسییەوە بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسییەوە (یوسف/١٢/٥٨). براکان بۆیە یوسفیان نەناسیەوە چوونکە ماوەیەکی زۆر لەو دوور بوون و ئەویش جلّ و بەرگەکانی گۆڕابوو لەبەر ئەوەی جل و بەرگی شایانەی لەبەردابوو. کاتێك یوسفی لێیانی ڕوانی، وتی: ئێوە بە چ مەبەستێك هاتوون؟ وتیان: لەشامەوە هاتووین تا بۆ بنەماڵەکەی خۆمان خواردن (گەنم) ببەین. یوسف وتی: درۆ دەکەن. ئێوە سیخوڕن. چۆنییەتی کاری خۆتان بەراستی بەمن بڵێن. وتیان: ئێمە دەبراین و منداڵی پیاوێکی راست کردارین. دوانزە برا بووین و برایەکمان لەگەڵ مان هات بۆ دەشت و لەناوچوو. باوکمان ئەوی زیاتر لەهەمووان خۆشدەویست. یوسف وتی: دوای ئەو باوکتان زیاتر رویکردە کێ و ئارام بوویەوە؟ وتیان: بەبرایەك بچوکتر لەو. یوسف وتی: ئەو بێنن بۆ لای من تا ببینم. ئەگەر ئەو نەهێنن لای من هیچ بارێکتان بۆ بردن پێنادرێت و نزیك مەکەونەوە. وتیان: داوای ئەو لەباوکمان دەکەین و ئەم کارە دەکەین (یوسف/١٢/٦٠—٦١). یوسف وتی: یەکێك لەخۆتان وەك بارمتە لێرە بەجێبێڵن. شەمعونیان دانا چوونکە تیروپشك بەناوی ئەو دەرهات. یوسف ساز وبەرگی ئەوانی ئامادە کرد و بەنۆکەرەکانی خۆی وت: کالای ئەوان یانی (بەهای گەنمەکە) لەناو گەنمەکەدا دابشارن رەنگە ئەوان

بگەڕێنەوە. یوسف دینداری و ئەمانەتی ئەوانی دەزانی و ئاگادار بوو ئەم کارە ئەوان ناچار بەگەڕانەوە دەکات و بۆ ئەم مەبەستە دەگەڕێنەوە لای ئەو.

دەستەیەك دەڵێن: دارایی ئەوانی بۆیە گەڕاندەوە چونکە دەترسا سامانیان نەبێت و نەتوانن بۆ میسر بگەڕێنەوە. بەڵام کاتێك کاڵاکەی خۆیان ببینن بێ گومان دەگەڕێنەوە. یوسف کە ڕۆژگاری تاڵی خەڵکی بینی، بەهاوکاری کردنیان هەستا و لە خۆبوردویی نیشاندا و ئایینی بەرابەری بەکاربرد. بەهەر پیاوێك باری وشترێکی دەدا.

کاتێك براکان لەگەڵ بارەکانی خۆیان گەڕانەوە بۆ لای باوکیان، وتیان: ئەی باوکە، عەزیزی میسر ڕێز لێگرتین کە ئەگەر خۆی یەکێك لەمناڵەکانی یەعقوب بووایە، شتێکی زیاتر لەمەی نەدەکرد. عەزیزی میسر شەمعونی وەك بارمتە لای خۆی ڕاگرت و بەئێمەی وت: برایەك کەدوای ئەو برا ونبووەتان باوکتان پێی ئارام بۆتەوە، بێننە لای من، ئەگەر نەیهێنن لای من هیچتان بەرناکەوێت و بۆ لای من مەگەڕێنەوە (یوسف/١٢/٦٠). یەعقوب وتی: ئایا دەتوانم ئێوە لەسەر ئەو بەئەمین بزانم لەکاتێکدا ئێوەم بۆ براکەتان یوسف بەئەمین زانی؟ خوا خۆی باشترین پاسەوانە و میهرەبانترینی میهرەبانەکانە. کاتێك بارەکەی خۆیان کردەوە ئەوەی وەك بەهای گەنمەکە دابوویان لەناو بارەکەی خۆیاندا بینیان کە بۆ ئەوان گەڕابوویەوە. وتیان: باوکە، ئێمە درۆناکەین. ئەمە دارایی ئێمەیە بۆ ئێمە گەڕاوەتەوە. ئێمە جارێکیتر لەگەڵ براکەمان (بنیامین) دەڕۆینە میسر و بۆ کەس و کاری خۆمان گەنم دەهێنین و بەباشی براکەمان دەپارێزین و بارە وشترێك زیاتر دەهێنین (یوسف/١٢/٦٤—٦٥). یەعقوب وتی: یەك بار وشتر کاڵایەکی کەمە (یوسف/١٢/٦٥). دواتر یەعقوب وتی: هەرگیز ئەو لەگەڵ ئێوەدا نانێرم مەگەر ئەوەی بەڵێنێکی خوایی بەمن بدەن کەدەیگەڕێننەوە مەگەر ئەوەی هەمووتان لەناوچن و ناتەوان بن. کاتێك پەیمانیان لەگەڵدا بەست، وتیان خوا بۆ ئەم پەیمانەی بەستمان شایەت بێت (یوسف/١٢/٦٦). دوای ئەوە فەرمانی بەبراکەیان بنیامیندا لەگەڵ براکانیدا بڕوات. پێشنیاری پێکردن و وتی: کوڕەکانم، لەیەك دەروازەوە مەڕۆنە

ناوشار بەڵکو لەدەروازە جۆراوجۆرەکانەوە برۆنە ناوشار و بزانن ئەگەر خوا شتێکی بوویێت، من هیچ کارەم. فەرمانی خوا راستە. کاری خۆم بەو سپارد و دەبێت بەو بسپێرن کاری خۆیان سپێردەران(یوسف/١٢/٦٧). یەعقوب لەچاوی پیس بۆ ژیانی ئەوان دەترسا چوونکە روخساریان جوان بوو. بەو شێوەیان کرد کەباوکیان فەرمانی پێدابوون. کاتێك براکان هاتنە لای یوسف، براکەی خۆی بنیامینی لای خۆی پەنا دا وتی: من براکەی تۆم یوسف. تا نەترسیت لەوەی ئەوان دەیکەن و دەیانکرد(یوسف/١٢/٦٩). بنیامین یوسفی ناسییەوە. ئەوانی لەماڵێکدا نیشتەجێ کرد و چەندین کەسی بۆ خزمەت کردنی ئەوان دانا و بۆ ئەوان خواردنی نارد و هەر دەکەسیانی لەسەریەك سفرە دانیشاند. بنیامین بەتەنیا مایەوە، گریا و وتی: ئەگەر براکەم یوسف زیندو دەبوو لەگەڵ مندا دادەنیشت. یوسف وتی: ئەم برایەی ئێوە بە تەنیا ماوەتەوە. لەبەر ئەمە یوسف خۆی لەگەڵ ئەو دادانیشت و لەگەڵ ئەودا خواردنی خوارد. کاتێك شەو هات، جێگەی هێنا و رایخست و وتی: هەر دوبرا لەسەر یەك جێگە بخەون. بنیامین تەنیا مایەوە و یوسف وتی: ئەمە لەگەڵ من دەخەوێت. شەوی لەگەڵ ئەو بەسەر برد. یوسف بۆنی دەکرد و خۆی لێ نزیك دەکردەوە تا بەیانی هات. بنیامین باسی خەمی دووری یوسفی بۆ دەکرد. یوسف وتی: ئایا دەتەوێت لەجیاتی برا ونبووەکەت برای تۆبم؟ بنیامین وتی: کێ برای وەك تۆی دەست دەکەوێت؟ بەڵام تۆ لەیەعقوب و راحیل نەبوویت. یوسف گریا و هەستا و بەرەو لای رۆشت. ئەوی لەئامێز گرت و وتی: من براکەی تۆ یوسفم، کەواتە لەوەی لەرابردوو کردوویانە، خەمبار مەبە. خوا چاکەی لەگەڵ ئێمەدا کردووە. ئەم نهێنییە لای براکان باس مەکە.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك براکان هاتنە لای یوسف، یوسف بەپەنجە لەئاوەخۆرییەکەی پاشای دەدا، وتی: ئەم ئاوەخۆرییە بەمن دەڵێت ئێوە دوانزە کەس بوون و براکەی خۆتان فرۆشتووە. کاتێك بنیامین ئەمەی بیست وتی: لە ئاوەخۆرییەکەت بپرسە ئایا براکەم یوسف هێشتا زیندووە یانە. ئەو بەپەنجە لە ئاوەخۆرییەکەی دا و وتی: براکەت هێشتا زیندووە و بەم زووانە چاوی بەتۆ دەکەوێت. بنیامین وتی: هەر

کارێکت دەوێت لەگەڵ مندا بیکە بۆ ئەوەی ئەگەر براکەم لەبوونی من ئاگادار بێت، بەدوامدا بگەڕێت و بمدۆزێتەوە یا رزگارم بکات. دەڵێت: یوسف رۆشتە ژوور، دەستی کرد بەگریان و دواتر گەڕایەوە بۆ لای براکان. دەڵێت: کاتێك یوسف وشتری براکانی بار کرد، ئەو دەفەرەی گەنمیان پێ پێوانە دەکرد و بە عەرەبی (صواع)ی پێدەڵێن لەناو باری براکەی خۆی بنیامین داشارد. ئەم دەفرە سیمین بوو. دەستەیەك دەڵێن: دەفرێك کەناویان تیادەخواردەوە ( بە فارسی ئاوەخۆری پێدەڵێن). بنیامین لەم کارەی براکەی ئاگادار نەبوو.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك بنیامین زانی ئەم پیاوە براکەی یوسفە، وتی: لەتۆ جیانابمەوە. یوسف وتی: من لەخەم خواردنی باوك و دایکمان دەترسم و لەلایەکیتر ناتوانم تۆ رابگرم و بتهێڵمەوە مەگەر ئەوەی تۆ بەکارێکی خراپ تاوانبار بکەم. بنیامین وتی: ئەم کارە بکە. یوسف وتی: ئاوەخۆری دەخەمە ناو بارەکەی تۆ و ئەوسا بەدزی تاوانبارت دەکەم تا تۆ لەوان بستێنم. بنیامین وتی: ئەم کارە بکە. کاتێك ئەم کارەی کرد ( و کاروان بەرێکەوت) جارچییەك لەبەر دەرگای شار جاڕیدا: ئەی کاروانیان، راوەستن کە لەناو ئێوەدا دز هەیە. وتیان و لەم کاتەدا بە جارچییان وت چیتان ون کردووە؟ وتیان : ئاوەخۆری پاشامان ون کردووە و هەر کەس بیگەڕێنێتەوە وشترێك باری پێدەدرێت ومن خۆم بەڵێنی ئەم کارە دەدەم. براکان وتیان: سوێند بەخوا ئێوە دەزانن ئێمە بۆ دزی نەهاتوین(یوسف/١٢/٧٠—٧٣). چوونکە ئێمە بەهای گەنمەکەمان لای یوسف هێناوەتەوە. کاتێك ئەمەیان وت، وتیان: ئەگەر درۆزن بن سزای ئەم کارە چی بێت؟ براکان وتیان: ئاوەخۆری لەباری هەرکەسێکدا دۆزرایەوە خۆی بەرگەی سزاکەی بگرێت چوونکە ئێمە ستەمکاران بەم شێوەیە سزا دەدەین (یوسف/١٢/٧٤—٧٥). ئەگەر دزەکەتان دۆزییەوە لای خۆتان بیهێڵنەوە. یوسف دەستی بەگەڕانی باری براکان پێش لەباری بنیامین کرد و ئەوسا ئاوخۆرییەکەی لەناو باری براکەی خۆی هێنایە دەر و وتی: ئێستا دەڵێن چی. براکان وتیان: ئەگەر ئەو (بنیامین) دزی کردبێت پێشتریش براکەی یوسف دزی کردووە. یوسف بەخۆی وت: ئێوە خراپتر لەدزن و خوای گەورە دەزانێت ئەوە چییە ئێوە

باسی دەکەن (یوسف/١٢/٧٦—٧٧). مەبەستی ئەوان لەدزی پێشووی یوسف بوو. ئەم دزییە بەمشێوەیە: یوسف بتێکی لەدایەگەورێی خۆی دزی و شکاندی. ئێستا ئەوان یوسفیان بۆ ئەو کارەی رابردوو سەرکۆنە دەکرد. دەستەیەکیتر ئاماژە بەداستانی پشتێنەکە دەدەن کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

کاتێك کاڵای دزی لەباری ئەو کورە هاتەدەر، براکانی وتیان: ئەی کوڕی راحیل ئێمە بەردەوام بەهۆی ئێوەوە ئازار دەبینین. بنیامین وتی: بەڵکو کوڕەکانی راحیل بەردەوام بەدەست ئێوە لەئازاردان. ئەم ئاوەخۆرییە کەسێك خستیە ناوبارەکەی من کە بەهای گەنمەکەی خستە ناو بارەکەی ئێوە.

یوسف براکەی بنیامینی بە فەرمانی براکانی گرت و کاتێك ئەوان بینیان لەبەرابەر ئەو چارەیان نییە، داوایان لێکرد بنیامینیان بۆ بگەرێنێتەوە. لەبەر ئەمە وتیان: ئەی پیاوی بەرێز، ئەو باوکێکی پیر و پەککەوتەی هەیە، یەکێك لەئێمە لەجیاتی ئەو بگرە چوونکە کەسێکی چاکەکاریت. یوسف وتی: پەنا بەخوا ئەگەر کەسێك جگە لەو کەسە بگرم کە کاڵاکەی خۆم لەناو بارەکانیدا دۆزیوەتەوە، ئەگەر ئەم کارە بکەم لەستەمکارانم(یوسف/١٢/٧٨—٧٩). کاتێك لەو بێ هیوا بوون، بڕیاریاندا و راوێژیان کرد. گەورەی ئەوان، شەمعون، وتی: مەگەر نازانن باوکتان پەیمانی خوایی لێوەرگرتن تا براکەتان بنیامین بگەرێننەوە مەگەر ئەوەی هەمووتان لەناو بچن. پێش ئەمەیش بۆ یوسف کەمتەرخەمیتان کرد. من لێرە ناڕۆم تا باوکم فەرمانێك بدات بڕۆمە دەر یا شەر دەست پێبکەم یا خوا فەرمانی خۆی بنێرێت کە ئەو باشترینی فەرماندەرانە(یوسف/١٢/٨٠).

کاتێك گەڕانەوە بۆ لای باوکیان و داستانەکەی بنیامین یان گێڕایەوە و وتیان شەمعون لەمیسر ماوەتەوە، یەعقوب وتی: بەم شێوە نییە بەڵکو جەستەی ئێوە کارێکی دایە دەست ئێوە. هەنووکە تەنیا دەبێت خۆڕاگر بم. بەڵکو خوا هەموویان بۆ لای من بگەرێنێتەوە چوونکە ئەو زانای فرمزانە (یوسف/١٢/٨٣). بەڵکو یوسف و بنیامین و شەمعون، هەموویان بگەرێنەوە. پشتی تێکردن و وتی: بەداخەوە، بۆ

دووری کورەکەم یوسف! و چاوەکانی ئەو لەگریان و خەم ، سپی بوو، بەو خەم خواردنە ئۆقرەی لێبڕابوو (یوسف/١٢/٨٤). کوڕەکانی پێیان وت: سوێند بەخوا هیچت دەست ناکەوێت لەیاد کردنی یوسف. بەردەوام باسی ئەو دەکەیت تا خۆت لەناوبەریت و لەخەمی ئەو بسوتێیت یا لەناوبچیت لەگەڵ لەناوچووان. یەعقوب وەڵامی ئەوانی دایەوە و وتی: تەنیا دەردی دڵی خۆم لەگەڵ خوادا باس دەکەم و خەمی خۆم تەنیا بەو دەڵێم و لەخوا ئەوە دەزانم ئێوە نایزانن (یوسف/١٢/٨٥—٨٦). دەزانم خەوەکەی یوسف دێتەدی.

دەڵێن: یەعقوب هاوشێوەی حەفتا خەمبار ئازاری دەکێشا و پاداشتی سەد گیانبازی وەرگرت.

دەڵێن: دراوسێیەکی یەعقوب هاتە لای و وتی: ئەی یەعقوب، تێکشکاویت و لەناوچویت و هێشتا بە ساڵانی باوکایەتیت نەگەشتویت. یەعقوب وتی: ئەوەی منی تێکشکاند و لەناوبرد، تاقی کردنەوەیەك بوو لەلایەن خواوە کەگرفتاری خەمی دووری یوسفی کردم. خوا وەحی بۆ یەعقوب نارد: ئایا لەمن بۆ ئافرێنراوەکان پەنا دەبەیت؟ یەعقوب وتی: خوایە، هەڵەیەك بوو، لێمخۆشبە. وتی: لێتخۆشبووم. لەبەر ئەمە هەرکاتێك شتێکیان لێدەپەرسی، دەیوت: رەنج خەمی خۆم تەنیا لەگەڵ خوادا باس دەکەم. خوا وەحی بۆنارد: ئەگەر یوسف و بنیامین مردبوون ئەوانم بۆتۆ زیندوو دەکردەوە. لەبەر ئەمە تۆم گرفتاری ئەو تاقی کردنەوە کرد چوونکە بۆنی کەبابیماڵەکەت دەرخوارد دراوسێ برسیەکەت دا بێ ئەوەی بەشی بدەی.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری گرفتار بوونی ئەو لەتاقی کردنەوە ئەمە بوو: یەعقوب مانگایەکی بوو و مانگاکە گوێرەکەیەك. یەعقوب ئەو گوێرەکەی لەبەر چاوی دایکیدا سەربڕی، مانگا دەینالاند. یەعقوب دەستی هەڵنەگرت و بەزەیی پیایدا نەهاتەوە. لەبەر ئەمە گرفتاری ونبوونی خۆشەویسترین منالەکانی بوو. دەستەیەك دەڵێن: مەڕێکی سەربڕی و لەم کاتەدا سواڵکەرێك لەدەرگای ماڵەکەی دا بەڵام بەشی سواڵکەرەکەی نەدا. خوا لەمبارەوە وەحی بۆنارد و ئاگاداری کردەوە ئەم کارە بۆتە

هۆی گرفتاربوونی لەتاقی کردنەوەیەك. دواتر یەعقوب خواردنێکی دروست کرد جاڕیدا: هەر کەس بەرۆژووە ، رۆژوی خۆی لای یەعقوب بشکێنێت.

فەرمانی بەمناڵەکانیدا بۆمیسر بگەڕێنەوە و لەبارەی یوسف وبراکەی بنیامین لێکۆڵینەوە بکەن. ئەوان بۆ میسر گەڕانەوە و هاتنە لای یوسف و وتیان: ئەی پیاوی ڕێزدار، ئێمە و کەس و کارمان هەژاری و نەداری بوو بەبەشمان و هەنووکە سامانێکی کەممان هێناوە. فەرمان بدە پێوانە لەسەرئێمە بپێون و چاکە لەگەڵ ئێمەدا بکە چوونکە خوا چاکەکاران پاداشت دەکات (یوسف/٨٨/١٢). دەڵێن: سامانەکەیان دەرەمی ناراست بوو و دەستەیەك دەڵێن: رۆن و پەشم بوو. کەسانیتر شتی تریان وتووە. بەیوسفیان وت: چاکە و خێر لەگەڵ ئێمەدا بکە یانی لەجیاوازی نێوان سامانی کەمی ئێمە و کالآکەی خۆت خۆشبە و بەئێمەی ببەخشە. دەڵێن: چاکە لەگەڵ ئێمەدا بکە لەرێگەی گەڕانەوەی براکەمان. کاتێك یوسف قسەی ئەوانی بیست، نەیتوانی بگرێت و لەهۆش خۆی چوو. دەستی بەگریان کرد، وەك لافاو فرمێسکی باراند و ئەوەی لەدڵیدا بوو، هێنایە سەرزمان. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوە ئەم نهێنییەی ئاشکرا کرد چوونکە کاتێك بەیەعقوب وترا کورەکەیان بەتاوانی دزی گرتووە، وەرەقەیەکی هەڵگرت و نامەیەکی نووسی. ئەمە ناوەرۆکی نامەکەیە:

((لەیەعقوب، ئیسرائیلی خوا کوری ئیسحاق، سەرپڕاوی خوا کوری ئیبراهیم، خۆشەویستی خوا بۆ عەزیزی میسر کە دادپەروەی ئاشکرا دەکات.

بەلآم دواتر ئێمە بنەماڵەیەکین تاقی کردنەوەیان لەسەر ئێمە داناوە و ئێمەیان پێ گرفتار کردووە. باوەگەورێم ئیبراهیمیان بەدەست و پێ بەستراو خرایە ناو ئاگرەوە بەلآم خوا بۆی کردە گوڵستان. دەست وپێی باوکمیان بەست و ویستیان لەرێگەی خوا قورگی بەکێرد ببڕن بەلآم خوا بەرخێکی لەجیاتی ئەو نارد. منیش کوڕێکم بوو کە لەهەموو مناڵەکانم زیاترم خۆشدەویست و براکانی ئەویان لەگەڵ خۆیدا بردە بیابان و کراسە خوێناویەکەیان گەڕاندەوە و وتیان گورگ خواردوویەتی. کوڕێکیترم بوو لەگەڵ ئەو کورە لەیەك دایك بوو، دڵم بەو خۆش بوو، ئەویش براکانی بردیان و

گەڕانەوە و وتیان: دزی کردووە و تۆ ئەوت خستۆتە زیندان. ئێمە بنەماڵەیەکین دزی ناکەین و دز پەروەردە ناکەین. ئەگەر ئەو بۆ من بگەڕێنیتەوە چ باشتر و گەرنە لای خوا دۆعایەکی وات لێدەکەم داوێنگیری حەوتەمین پشت لەکوڕەکانت بێت)).

کاتێك یوسف نامەکەی خوێندەوە، ئارامی لێبڕا و دەستی بەگریان کرد و ناسنامەی خۆی بۆ ئەوان ئاشکرا کرد، وتی: ئایا دەزانن لەو کاتەی نەزان بوون لەگەڵ یوسف و براکەی چیتانکرد؟ وتیان: های! بەراستی تۆ یوسفی؟ وتی: من یوسفم و ئەمەیش برای منە. خوا منەتی کردە سەرمان کەئێمەی لەگەڵ یەکدا کۆکردەوە. هەرکەس خۆی بپارێزێت و خۆراگری بکات، خواچاکەی چاکەکاران بێ وەڵام ناهێڵێتەوە (یوسف/١٢/٨٩—٩٠). براکانی داوای لێبووردنیان کرد و وتیان: سوێند بەخوا، خوا لەپێشی بەتۆ بەخشیوە و ئێمە گوناحکاران بووین. یوسف وتی: ئەمرۆ سەرکۆنەکردن لەسەر ئێوە نییە- یانی: باسی هیچ ناکەم و گوناحەکتان بیرناهێنمەوە- خوا لێتان خۆش بێت چوونکە باشترینی باشەکانە (یوسف/١٢/٨٩—٩٢). ئەوسا یوسف سەبارەت بەباوکی پرسیاری کرد. وتیان: کاتێك بنیامینی لەدەست رۆشت، ئەوەندە گریا تا کوێر بوو. یوسف وتی: ئەم کراسەی من ببەن و بیخەنە سەر روخساری تا بینایی بۆ بگەڕێتەوە و ئەوسا هەموو کەس و کاری خۆتان بێنن بۆلای من (یوسف/١٢/٩٣). یەهودا وتی: من کراسەکە دەبەم چوونکە من بووم کراسە خوێناوییەکەی یوسفم بۆ باوکم برد و وتم یوسف گورگ خواردوویەتی. ئێستا منم پێی دەڵێم ئەو زیندووە، شادمانی دەکەم بەو شێوەی ناراحەتم کرد. ئەو بوو بە مژدەدەر.

کاتێك کاروان بەرێکەوت و لەمیسر هاتەدەر، با بۆنی یوسفی بەیەعقوب گەیاند. دووری ئەوان هەشتا فەرسەنگ بوو. یوسف لەمیسر و یەعقوب لەسەرزەمینی کەنعان بوو. یەعقوب وتی: ئەگەر بەنەزان و خڵەفاوم نەزانن، بۆنی یوسف کەم. کەسانێك لەمناڵەکانی کەلەوێ ئامادە بوون وتیان: سوێند بەخوا تۆ لەبیرهێنانەوەی یوسف لەسەر هەمان گومڕایی خۆتا ماویتەوە. کاتێك موژدەدەر کراسەکەی هێنا و خستیە سەر روخساری یەعقوب، ئەو بینایی چاوەکانی بەدەست هێنایەوە. وتی: مەگەر

بەنێوەم نەوت لەخوا ئەو شتانە دەزانم کەئێوە نایزانن؟ یانی دەزانم خوا یوسف بۆمن دەنێرێتەوە (یوسف/١٢/٩٥—٩٦). کاتێك موژدەدەر گەیشت، یەعقوب وتی: یوسفت چۆن بەجێهێشت؟ وتی: ئەو پاشای میسرە. یەعقوب وتی: لەگەڵ پاشایەتیدا چی بکەم؟ ئەو لەسەر چ دینێك بوو کاتێك بەجێتهێشت؟ وتی: خواپەرەستی. یەعقوب وتی: ئێستا نیعمەت تەواو و گشتگیر بوو. کاتێك ئەو منالآنەی ئامادە بوون کراسەکەی یوسفیان بینی و هەواڵی ئەویان بیست وتیان: باوکە، بۆ گوناحەکانی ئێمە لای خوا داوای لێبووردن بکە. وتی: بە زوویی لەخواوەند داوای لێخۆشبوون دەکەم کە ئەو بەخشەرێکی میهرەبانە (یوسف/١٢/٩٨). دۆعای خۆی بۆ بەرەبەیانی رۆژی هەینی دواخست.

یەعقوب و منالەکانی بەرەو میسر کەوتنە رێ. کاتێك گەشتنە نزیك میسر، یوسف و هاوەڵانی لەخەڵکی ئەو وڵاتە، پێشوازیان لێکرد چوونکە زۆر بەرێزدار و گەورەیان دەزانی. یەعقوب سەیری فەرەبالغی خەڵك و سوار و ئەسپەکانی کرد - و ئەو بە پشت بەستن بەیەهودا بەرێگادادەرۆشت- (بە یەهودای )وت: کورم ئەوە فیرعەونی میسرە. یەهودا وتی: نە، ئەمە کورەکەت یوسفە. کاتێك پێی گەشت یوسف ویستی سلآو و دروودی بۆ بنێرێت بەلآم رێگەی ئەم کارەیان لێگرت. یەعقوب وتی: -سلآو لەتۆ ئەی رەوێنەوەری خەم- ئەمەی لەبەر ئەوە وت کە لەکاتی ئەمانی یوسف بۆ ساتێکیش لە گریان و خەمی خۆی دور نەکەوتبوویەوە.

کاتێك هاتنە میسر، یوسف دایك و باوکی خۆی خستە سەر تەختی پاشایەتی. دەستەیەك دەڵێن: ئەم دووانە دایك و باوکی یوسف نەبوون بەڵکو باوك و پووری بوون چوونکە دایکی یوسف مردبوو. یەعقوب و دایکی یوسف و براکانی کەوتنە سەر زەوی و نوێژیان بۆ یوسف برد وئەمە شێوەی رێز گرتن لەپاشاکان بوو. مانای نوێژ بردن لێرەدا دانانی ناوچاو لەسەر خاك نییە چوونکە ئەم کارە جگە بۆخوا شیاو نییە بەڵکو ماناکەی کورنوش بردن و چەمانەوە لەکاتی هاتنە ژوورەوەیە بەهەمان شێوە کەئێستا بۆ پاشاکان و فەرمانرەواکان کورنوش دەبەن. یوسف وتی: باوکە ئەمە سەرئەنجامی خەوەکەی منە کە خوا هێنایە دی (یوسف/١٢/١٠٠).

نێوان خەو بینینی یوسف و هاتنی یەعقوب چل ساڵ و  بە وتەی دەستەیەك كەس هەشتا ساڵ درێژەی كێشا چوونكە یوسفیان لەتەمەنی ١٧ ساڵیدا خستە ناو چاڵ و كاتێك باوكی بینییەوە، تەمەنی هەشتا ساڵ بوو. دوای كۆبوونەوەی بنەماڵە یوسف بیست و سێ ساڵ ژیا. یەهودای برای خۆی كردە جێگر. دەستەیەك دەڵێن: دووری یوسف لەیەعقوب ١٨ ساڵی خایاند. هەروەها دەڵێن: كاتێك یوسف هاتە میسر ١٧ ساڵی بوو و فیرعەون ١٣ ساڵ دوای هاتنی بۆ میسر ئەوەی كردە وەزیری خۆی و ماوەی دووركەوتنەوەی لەیەعقوب ٢٢ ساڵی خایاند. مانەوەی یەعقوب و بنەماڵەكەی لەمیسر ١٧ ساڵی خایاند. ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیكە داوە و خوا زاناترە.

كاتێك مەرگی یەعقوب نزیك كەوتەوە، لای یوسف وەسیەتی كرد لای باوكی، ئیسحاق بەخاكی بسپێرێت. یوسف ئەم كارەی كرد وجەنازەی ئەوی بردە شام و لای باوكی بەخاكی سپارد. دواتر گەڕایەوە بۆ میسر. یوسفیش وەسیەتی كرد جەنازەكەی لەمیسر ببەن و لای باوك و باوەگەورێكانی بینێژن. كاتێك موسی لەگەڵ منداڵەكانی ئیسرائیل لەمیسر هاتەدەر، پەیكەری یوسفیشی لەگەڵ خۆی هێنا.

یوسف ئەفراییم و مونشی هێنایە دنیا. بۆ ئەفراییم نون لەدایك بوو و بۆ نون، یوشع قوتابی موسا هاتە دنیا كە دەڵێن هەمان موسا كوڕی عیمران بوو. شوێنكەوتوانی تەورات گومان دەكەن ئەو موسای خضر بوو. بە وتەی هەندێ كەس بۆ ئەو رەحمەت – ژنی ئەیوب- لەدایك بوو.

## داستانی شوعەیب

دەڵێن: ناوی شوعەیب یەسرون کوڕی زەیعون کوڕی عەناق کوڕی سابت کوڕی مودیەن کوڕی ئیبراهیم بوو یا شوعەیب کوڕی میکیل لەبنەماڵەی هەندێ لەو کەسانەی باوەریان بەئیبراهیم هێنابوو ولەگەڵ ئەودا بۆ شام کۆچیان کرد. بەڵام ئەو کوری کچی لوت بوو. بەم پێیە، دایەگەورێی شوعەیب کچی لوتە. شوعەیب کوێربوو. ئەم ئەو بابەتەیە لەم ئایەدا باسی کراوە کەفەرموویەتی: خەڵك پێیان وت: ئەی شوعەیب، ئێمە تۆ لەناو خۆمان بەداماو دەزانین (هەد/١١/٩١). یانی تۆ کوێریت و ناتوانیت کاروباری پێغەمبەری بەرێوە ببەیت.

پێغەمبەری ئیسلام هەرجار کەبیری ئەوەی دەکردەوە دەیفەرموو: ئەو پیاوە، زمان پاراوی پێغەمبەرەکان بوو چوونکە لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی بەباشی هەڵس وکەوتی دەکرد وبە نەرمی لەگەڵیان دەئاخاوت. خوا ئەوی بۆ لای خەڵکی مەدیەن نارد و ئەوانە خواوەندەکانی (ئەیکە) بوون و ئەیکە داری چڕ و پڕە. ئەوان باوەریان بەخوا نەبوو و پێوانە و شایەنەکانیان کەم دەکردەوە و سامانی خۆیان لەرێگەی چەوتەوە بەدەست دەهێنا و لەناویان دەبرد. خواوەند رۆژی بۆ ئەوان فراوان و ژیانی بۆ بەربلاو کردبوون لەبەر ئەوەی دەرفەت بەناسپاسی کردنی ئەوان بدات و لەگەڵ هەمووی ئەمانە، رۆژگاری بۆ ئەوان درێژ کردەوە. شوعەیب پێی وتن: ئەی خەڵکانی من، خوا بپەرەستن چوونکە ئێوە جگە لەو خوایەکتان نییە و پێوانە و شایەنەکانتان کەم مەکەنەوە. بەباشی لەئێوە دەروانم و بەباشی لەئێوە ئەندێشە دەکەم و لەگەڵ ئەوەشدا لەو ئەشکەنجەی لەهەر لایەکەوە بەسەر ئێوەدا دەبارێت، دەترسم (هود/١١/٤٨).

کاتێك پێداگری ئەوان لەسەر هەڵە و ناراستی درێژەی کێشا و بیرهێنانەوەکانی شوعەیب و ئاگادارییەکانی ئەو لەبارەی ئەشکەنجەی خوایی جگە لەپێداگرتن دواهاتێکی نەبوو، خوا ئەشکەنجەی رۆژی (بای گرەی) بۆناردن و ئەمە ئەوەیە عەبدوالله کوری عەباس لەلێکدانەوەی ئەم ئایە باسی دەکات: ئەوان بەئەشکەنجەی

بای گرە( ڕۆژی سێبەری ناگرین، ڕۆژی هەوری ناگرین) گرفتار بوون کەئەشکەنجەیەک مەترسیدارە( شعرا/٢٦/١٨٩). کوڕی عەباسیش وتوویەتی: خوا ئاگر و گەرمایەکی سەختی بۆ ناردن کەرێگەی هەناسەدانی ئەوانی گرت و لەبەر ئەمە لەماڵەکانی خۆیان هاتنەدەر و بەهەڵاتن ڕوویان لەبیابان کرد. خوا هەورێکی نارد کە لەبەرابەر هەتاو سێبەری دروست کرد. لەناو هەورەکەدا هەستیان بەساردی و فێنکی کرد و هەموویان لەژێریدا کۆبوونەوە. لەم کاتەدا خوا ئاگری بەسەردا داباراندن. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: ئەمەیە ئەشکەنجەی ڕۆژی سایەوان.

قتادە دەڵێت: خوا شوعەیبی وەك پێغەمبەر بۆ لای دوو ئەتەوە نارد. بۆ خەڵکەکەی خۆی و بۆ خاوەنەکانی ئەیکە. ئەیکە داریستانێکی چڕ وپڕ بوو. کاتێك خوا مەبەستی ئەوەی کرد ئەشەکەنجەیان بدات، گەرمایەکی دژواری ڕەوانە کرد بەشێوەیك گومانیان کرد هەورە. کاتێك لێیان نزیك بوویەوە بەهیوایی ساردی هەورەکە، بەرەو لای ڕۆشتن و لەژێریدا کۆبوونەوە. ئەو هەورە، بارانی بەسەردا داباراندن و ئەمە ئەوەیە خوا لەبارەیەوە دەفەرمێت: ئەوان ئەشکەنجەی ڕۆژی سایەوان لەناوی بردن.

بەڵام خەڵکانی مەدیەن، دەستەیەك لەوان منداڵەکانی مەدیەن کوڕی ئیبراهیمی خەلیل بوون و خوا ئەوانی بە بوومەلەرزە لەناو برد.

دەستەیەك لەزاناکان دەڵێن: خەڵکی شوعەیب یەکێك لە(سنوورەکانی) خوایان داخست و بەجێیان هێشت و لەبەرابەر ئەوە، خوا ڕۆژی ئەوانی فراوان کرد، دووبارە یەکێك لەسنووورە خوایەکانیان پشت گوێ خست و خوا ڕۆژی ئەوانی زیاد دەکرد. ئەوسا کاتێك خوا مەبەستی لەناو بردنی ئەوانی کرد، گەرمایەکی بۆناردن کەنەیانتوانی خۆیان سارد بکەنەوە یا لە ئاو و سێبەر سوود ببەن. وای لێهات یەکێك لەوان سێبەرێکی دەبینی و پەنای بۆ دەبرد و لە ژێریدا دەحەوایەوە و بانگی هاورێکانی خۆی دەکرد: وەرەن بەرەو ئاسایش. ئەوان بەرەو لای رایان کرد وکاتێك هەمووی لەژێریدا کۆدەبوونەوە، خوا بارانی ئاگرینی بۆ دەناردن. ئەمە هەمان

ئەشکەنجەی ڕۆژی سایەوانە.

عامر لەعەبدوالله کوڕی عەباس دەگێڕێتەوە: ئەگەر کەسێك لەچەند و چوونی ئەشکەنجەی ڕۆژی سایەوان قسەی لەگەڵداکردی، بە درۆزنی دابنێ.

مجاهید دەڵێت: ئەشکەنجەی ڕۆژی سایەوان، هەمان سێبەرە و بڵاوکردنی ئەشکەنجە لەسەر خەڵکی شوعەیبە. زەید کوڕی ئەسلەم لەبارەی ئەم ئایە وتارێکی هەیە: ئەوان وتیان: ئەی شوعەیب ئایا نوێژە فراوانەکانت فەرمانت پێدەدەن تا داوا لەئێمە بکەیت لەوەی باوکانمان دەیانپەرەستی، نەیپەرەستین یا لەگەڵ سامانی خۆمان ئەو کارە بکەین کە تۆ دەڵێیت؟ هەمانا تۆیت زیرەکی ڕاست مەبەست (هود/١١/٧٨). زەید کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ئەوان درەمەکانیان دەبڕی و ئەندازەکەیان کەم دەکردەوە.

## داستانی خزر و بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ موسا

خاوەن کتێبەکان دەڵێن: ئەو موسایەی بووە یار و هاوڕێی خزر، هەمان موسا کوڕی مونشی کوڕی یوسف کوڕی یەعقوبە. حەدیسی راست لەپێغەمبەر(د.خ) گێردراوەتەوە کەموسای یار و هاوڕێی خزر هەمان موسای کوڕی عیمرانە و ئاماژە پێ دەدەین. خزر لەو کەسانەیە لەسەردەمی پاشایەتی فەرەیدون کوڕی ئەسغیان (ئاتبین) دەژیا و ئەمە بەوتەی زاناکانی کۆن لەخاوەن کتێبەکان پێش موسا کوڕی عیمرانە. دەڵێن: ئەو فەرماندەی پێشرەوەکانی سوپای دوشاخداری گەورە (ذوالقرنین کبیرا) بوو کە لەرۆژگاری ئیبراهیم دادەژیا. ئەو لەگەڵ ذوالقرنین بە کانی ژیان گەشت و لەو ئاوەی خواردەوە بەڵام ذوالقرنین کە لەگەڵیدابوو، نەیدەزانی ئەمە کانی ژیانە. خزر جاویدان و بە گومانی ئەوان تا ئێستا زیندووە. دەستەیەك لەوان گومانیان بردوە: خزر لەمناڵی ئەو کەسانە بوو لەگەڵ ئیبراهیم باوەریان بەخوا هێنا و لەگەڵ ئەودا کۆچیان کرد و ناوی ئەو یەلیا کوڕی مەلەکان کوڕی فالغ کوڕی غابر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشەز کوڕی سام کوڕی نوحە. باوکی پاشایەکی گەورە بوو. کەسانیتر دەڵێن: ئەو دوشاخدارەی لەزەمانی ئیبراهیم دابوو، هەمان فەرەیدون کوڕی ئاسغیانە و خزر فەرماندەی پێشرەوەکانی سوپای ئەوە بووە.

عەبداله کوڕی شوزەب دەڵێت: خزر لەئێرانییەکانە، لەگەڵ ئەلیاس کە لەمناڵەکانی ئیسرائیلە، هەر ساڵ لەکاتی حەج کردن، لەمەککە چاویان بەیەك دەکەوێت. کوڕی ئیسحاق دەڵێت: خوا بۆ مناڵەکانی ئیسرائیل پیاوێکی لەخۆیان دیاری کرد کە ناوی ناشیە کوڕی ئەموص بوو. خوا خزری لەگەڵ ئەودا بۆ پێغەمبەری هەڵبژارد. دەڵێت: ناوی خزر بەپێی ئەوەی ئەوان (مناڵەکانی ئیسرائیل) دەیڵێن، ئەرمیا کوڕی حەلقیایە و ئەو لەکورەزاکانی هاورن کوڕی عیمرانە و لەنێوان ئەم و پاشایەتی فەرەیدون هەزار ساڵە.

وتاری ئەو کەسەی دەڵێت خزر لەسەردەمی فەرەیدون و ذوالقرنین گەورە پێش لەموسا کوڕی عیمران بوو، نزیکترە لەو حەدیسە راستەی دەڵێت خوا موسای بۆ

دۆزینەوەی خزر فەرماندا چوونکە پێغەمبەر(د.خ) زاناترینی جیهانیان بەروداوەکانی رابردووە. ئەگەری هەیە خزرێك کەفەرماندەی پێشرەوانی سوپای دوشاخدار بووە، پێش موسا ژیاوە و ئەو کەسەیە ئاوی ژیانی نۆش کرد و ژیانی درێژەی کێشا. ئەو لەرۆژگاری ئیبراهیم بۆ پێغەمبەری نەنێردرا بەڵکو لەرۆژگاری ئاشیە کوڕی ئەموس ئەو کارەی پێ سپێردرا. ئاشیە لەرۆژگاری بشتاسب (گشتاسب) کوڕی لهراسب بووە. حەدیسێك کە لەبارەی ئەو باسی کراوە ئەوەیە ئەبی کوڕی کەعب لەپێغەمبەری گێراوەتەوە.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: بەعەبدوالله کوڕی عەباسم وت: نوفا (لۆقا) گومانی دەکرد خزر یار و هاوڕێی موسا کوڕی عیمران نەبووە. کوڕی عەباس وتی: ئەم دوژمنی خوایە درۆی کردووە. ئەم حەدیسەی بۆ گێرامەوە لەئەبی کوڕی کەعب لەپێغەمبەری خوا کەدەفەرمێت: موسا کوڕی عیمران لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل وتارێکی خوێندەوە. کەسێك لەوی پرسی: زاناترینی خەڵك کێیە؟ موسی وتی: منم. خوا سەرکۆنەی کرد کە بۆ زانایی تایبەت بەخوا نازانێت. دوبارە موسا لەخوای پرسی: خوایە ئایا لەمن زاناتر کەسێك هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ هەیە و ئەو لە(دیدارگای دو زەریایە). موسا وتی: خوایە، چۆن دەتوانم ببینم؟ فەرمووی: ماسیەك هەڵگرە و بیخەرە ناوە سەبەتێکەوە. لەهەر شوێنێك ماسی ون بوو، بزانە ئەو پیاوە لەوێیە. ئەو ماسیەکی هەڵگرت و خستیە ناو سەبەتێکەوە. بەقوتابیەکەی وت: لەهەر شوێنێك ماسیەکەت ون کرد، ئاگادارم بکەرەوە. بەرێکەوتن و لە قەراغ دەریا ملی رێگەیان گرتەبەر تا گەشتنە ئەو تاشەبەردە و ئەو ئاوە. ئەمە هەمان ئاوی ژیان بوو. هەر کەس لەم ئاوە بخواتەوە جاویدان دەبێت و هیچ مردوویێك پێی ناگات مەگەر ئەوەی ژیان بەدەست بێنێتەوە. لێرەدا کەمێك لەو ئاوە کرا بەماسیەکەدا، دوبارە ژیانی بەدەست هێنایەوە. موسا خەوتبوو. ماسی لەناو سەبەتەکە جووڵا و رۆشتە ناو زەریا. خوا جووڵەی ئاوی دامرکاند و ئاو بوو بەهاوشێوەی کەوانەیەکی سەرداپۆشراو. ئاو بۆ ئەو ماسیە بوو بەدالآنێك و بۆ ئەو دووانە داستانێکی سەرسورهێنەر. بەرێکەوتن و کاتێك کاتی نیوەرۆ هات، موسا بەقوتابیەکەی وت: نانی

نیوەڕۆ بێنە، لەزۆری ڕۆشتن هیلاك بووین و ناتەوان (کهف/١٨/٦٢). موسا هیلاك نەبوو مەگەر دوای تێپەرین لەو شوێنەی خوا فەرمانی پێدابوو. قوتابی موسا وتی: هیچتان بینی ئەوکاتەی لەسەر تاشەبەردەکە بووین. لەوێ ماسیەکەم لەبیرکرد و دێو گرفتاری فەرامۆشی کردم. ماسی بە شێوەیەکی سەیر ڕۆشتە ناو ئاوەکە و ڕێگەی زەریایی گرتەبەر. موسا وتی: ئەمە ئەو شتەیە بەدوایدا دەگەڕاین. لەبەر ئەمە گەڕانەوە و بەدوایدا گەڕان (کهف/١٨/٦٣—٦٤). ئەو دووانە شوێن شوێنپێکانی خۆیان کەوتن تا گەشتنە تاشەبەردەکە. پیاوێکیان بینی ڕاکشاوە و پارچەیەکی کێشاوە بەسەر خۆیدا. موسا سلاوی لێکرد. پیاو وتی: سلاو لەکوێ دەتوانێت بگاتە سەرزەمینی ئێمە؟ وتی: موسام. وتی: موسا کوڕی ئیسرائیل؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەی موسا من لەخوا زانستێکم هەیە تۆ نیتە و تۆ لە خوا زانستێکت هەیە، من نیمە. موسا وتی: من هاوڕێیەتی تۆ دەکەم تا لەوەی فێری بوویت - و هۆکاری بەدەست هێنانە — منیش فێرکەیت. پیاوی زانا وتی: ئەگەر بەدوای مندا دەگەڕێیت ئاگادار بە لەهیچ شتێك نەپەرسیت تا خۆم نهێنییەکەیت بۆ باس بکەم (کهف/١٨/٧٠). ئەو دووانە لەسەر لێواری دەریا بەرێکەوتن و دواتر سوار کەشتی بوون. لەم کاتەدا چۆلەکەیەك هات و لەسەر لێواری کەشتی دانیشت و دەنوکی لە ناو دەدا و کەمێکی لێخواردەوە. خزر بە موسای وت: زانستی من و تۆ لە زانستی خوا کەم ناکاتەوە مەگەر ئەو ئەندازەیە کە ئەم چۆلەکە لەناوی دەریایی کەم کردەوە.

دەڵێت: ئەو کاتەی لەناو کەشتیدا بوون لەناکاو موسا بینی پیاوی زانا بزمارێك بەکەشتیەکەدا دادەکوتێت یا تەختەیەکی لێدەکاتەوە. موسا پێی وت: من و تۆیان بێ وەرگرتنی کرێ سوار کرد و ئێستا تۆ کەشتییەکەی ئەوان کون دەکەیت تا ئەوانەی لەناو کەشتییەکەدا سوار بوون لەناو بەریت. کارێکت کرد سەرسوڕهێنەر و گران لەسەر دڵی هەر کەسێك کەدەیبینێت دەیبیستێت. پیاوی زانا وتی: نەموت ناتوانیت خۆراگربیت؟ موسا وتی: بۆ ئەم فەرامۆشیەم لێم خۆشبە و لێم مەگرە (کهف/١٨/٧١—٧٣). دەڵێت: یەکەم کار بوو موسا لە فەرامۆشییەوە کردی. دەڵێن: ئەو دووانە بەرێکەوتن و ڕۆشتن. کوڕێکیان بینی لەگەڵ چەند منالێکی دیکە گەمەی

دەکرد. پیاوی زانا سەری گرت و لەجەستە جیای کردەوە. موسا پێی وت: ئایا گیانی پاکێکت کوشت بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێت؟ کارێکت کرد ناپەسەند. وتی: ئایا پێم نەوتی لەگەڵ من خۆراگری ناتوانیت؟ موسا وتی: ئەگەر دوای ئەمە شتێکم لەتۆ پرسی هاورێیەتیم مەکە. تۆ بۆ دوور خستنەوەی من لەخۆت بۆ بیانوو دەگەرێیت. بەرێکەوتن تا گەشتنە خەڵکی دێهاتێك و داوای خواردنیان لێکردن بەڵام دێهاتیەکان لەمیوانداری ئەوان خۆیان بەدوور گرت. ئەو دووانە کەسیان دەست نەکەوت خواردن و خواردنەوەیان پێبدات. دیوارێکیان بینی ئەوەندەی نەمابوو دارمێت. پیاوی زانا دووبارە دیوارەکەی دروست کردەوە و قایمی کرد. موسا وتی: ئەمیوانداری ئێمەیان کرد نە لەماڵەکانی خۆیان جێگەیان کردینەوە. ئەگەر دەتویست دەتوانی بۆ ئەم کارەت کرێ وەربگریت. پیاوی زانا وتی: کاتی جیابوونەوەی من و تۆ هاتووە. ئێستا نهێنی ئەوەی نەتدەتوانی خۆراگریان بۆ بکەیت بەتۆ دەڵێم. کەشتییەکە، هی دەستەیەکی رەنجبەر و هەژار بوو کە لەدەریادا کاریان دەکرد و لەداهاتی ئەوە، رۆژگاریان بەسەر دەبرد. دەمویست تێکی بدەم چوونکە لەپشت سەری ئەوان پاشایەك بوو هەر کەشتییەکی پتەو و قایمی داگیر دەکرد. بەڵام ئەو کورە منالە، دایك و باوکی لەباوەرداران بوون، ترساین ئەگەر بمێنێتەوە، ناپاکی و ناباوەری ئەو ببێتە هۆکاری گرفتار بوونی ئەوان. ویستمان خواوەند منالێکی دیکەیان پێ ببەخشێت باشتر لەو منالە. بەڵام دیوار، هی ئەو دوو منالە پێنەگەشتووە باوك مردووە بوو لەو شارەدا، لەژێر ئەو دیوارەدا گەنجێك بۆ ئەو دوو کورە باوك مردووە داشاردرابوو. باوکی ئەوان پیاوێکی راست کردار بوو. خوا ویستی ئەم دووانە گەشە بکەن و گەورە بن و گەنجەکەی خۆیان دەربێنن. ئەم بەخشینێك لەلایەن خووەندی تۆوە بوو. ئەم کارانەم بەفەرمانی خۆم نەکرد (بەڵکو بەفەرمانی خوا) ئەمەیە کردنەوەی گرێیی ئەو نهێنییەی نەتتوانی خۆراگری بۆ بکەیت (کهف/١٨/٧٤—٨٢).

عەبدوالله کوری عەباس بەردەوام دەیوت: ئەو گەنجە، جگە لەزانست هیچیتر نەبوو. لەکوری عەباسیان پرسی: باسی قوتابیەکەی موسامان نەبیست، ئەو چی بەسەرهات؟ وتی: لەئاوی ژیانی خواردەوە و جاویدان بوو. پیاوی زانا هەڵیگرت و خستییە سەر

کەشتیەکەی خۆی و رۆشتنە دەریا و کەشتی تا رۆژی کۆتایی لەسەر شەپۆلەکانی دەریا دەگەرێت و ئالآکەی هەڵدەکات.

ئەم حەدیسە ئاشکرای دەکات خزر پێش موسا – و لە رۆژگاری ئەویشدا- بووە. هەروەها نیشان دەدات ئەوانەی دەڵێن ئەو ئەرمیایە، ناراستیان کردووە چوونکە ئەرمیا لەرۆژگاری بخت النصردا بووە. لەنێوان رۆژگاری بخت النصر لەگەڵ موسا دووریەکی زۆرە کەلای کەسانی شارەزای مێژووی جیهان و خەڵکی دنیا داپۆشراو نییە. موسا لەزەمانی مەنوچێهر پاشایەتی گرتەدەست. پاشایەتی مەنوچێهر دوای باوکی فەرەیدون دەستی پێکرد.

## بەسەرهاتی كاری مەنوچێهر و رووداوەكانی رۆژگاری ئەو

دوای فەرەیدون كوڕی ئاسغیان (ئاتبین) كوڕی كاوە، مەنوچێهر هاتە سەر تەختی شاهەنشاهی. ئەو لەمناڵەكانی ئیرەج كوڕی فەرەیدون و لەدۆنباوەند یا (رەی) چاوی بەدنیا هەڵهێنا. كاتێك مەنوچێهر چاوی بەدنیا هەڵهێنا، ئەویان لە تور و سەلەم شاردەوە چوونكە لێی دەترسان. كاتێك گەورە بوو، ناردیان بۆ لای باووباپیرانی فەرەیدون.ئەو لەمەنوچێهردا نیشانەكانی سەروەری و سالاری بینی. تاجەكەی خۆی لەسەر سەری ئەودانا.

دەستەیەك گومانیان بردووە نەژادنامەی مەنوچێهر بەم شێوەیە: مەنوچێهر كوڕی شەجر كوڕی ئەفریقش كوڕی ئیسحاق كوڕی ئیبراهیم. دەڵێن: پاشایەتی بەم پیاوە گەشت. ئەمان لەوتاری جەریر كوڕی عەتییە بەڵگەیان هێناوەتەوە كەدەڵێت:

| | |
|---|---|
| و بنا اسحق الليوث اذا ارتدوا | حمائل موت لا بسينة السنورا |
| اذا انتسبووا عدوا الصبهبذ منهم | و كسري و عدوا الهرمزان و قيصرا |
| وكان كتاب فيهم ونبووة | وكانوا باصطخر الملوک وتسترا |
| فيجمعنا و الغر كورياء فارس | اب لانبالي بعدة من تاخرا |
| ابو خليل اللة و اللة ركوريا | رضينا بما اعطي الا لة و قدرا |

واتاكەی: كورانی ئیسحاق، كاتێك بەندی شمشێریان لەكەمەر بەست و زرێیان پۆشی، شێرە پیاو بوون. كاتێك باسی نەژادی خۆیان دەكەن، سوپاسالار و خوسرەو و هورمزان و سزار لەخۆیان دەزانن. پێغەمبەری و نوسراو لەناو ئەواندایە و ئەوان لەئیستەخر و شوش پاشا بوون. ئێمە لەگەڵ گەورە پیاوانی ئێران، باوكێك، پێكەوە دەمانبەستێتەوە كەدوای ئەو لەداهاتووان ترسمان نییە و پێشینیانیش بەهیچ ناژمێرین. باوكی ئێمە هاورێی خوایە و خوا ئافرێنەری ئێمەیە. رەزامەندین بەوەی

خوا بۆ ئێمەی نوسی و کردی بەچارەنوسی ئێمە.

بەڵام ئێرانییەکان ئەم نەژادنامەیە بەهەڵە دەزانن و پاشاکانی خۆیان تەنیا لەمناڵەکانی فەرەیدون دەزانن و بۆ کەسانیتر پاشایەتی لەبەرچاو ناگرن.

دەڵێم: گوومانی ئێرانییەکان راستە چوونکە ناوی پاشاکانی ئەوان دوای ئەسکەندەر ناسراوە و دوای ئەو رۆژگاری (پاشای تیرەکان) (شای عەشیرەکان) دەست پێدەکات. ئەگەر مەنوچێهیر لەسەردەمی موسا بێت — و هەموو رۆژگاری نێوان ئیسحاق تا موسا پێنج پشتی ناودارن کە بەردەوام لەمیسر دەژیان - ئەمان لەکام زەماندا زۆر بوون و لەهەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەوە و پاشایەتی ئێرانیان بەدەست هێناوە؟ لەکوێوە جەریر کوڕی عەتییە ئەوەندە زانا و زانستی هەبێت کەقسەکەی وەك بەڵگە بەکار ببرێت؟ بەتایبەت ئەوەی هەموویان بەمناڵەکانی ئیسحاق لەقەڵەم دەدات!

هشام کوڕی کەلبی دەڵێت: تور و سەلەم دوای براکەیان ئیرەج ٣٠٠ ساڵ پاشایەتیان کرد، ئەوسا مەنوچێهر ١٢٠ ساڵ فەرمانرەوایی کرد و لەم کاتە لەهەشتاهەمین ساڵی فەرمانرەوایەتی ئەو، کوڕی تور کەتورك بوو و لەتوران دەژیا، لەمەنوچێهر یاخی بوو و ئەوەی بۆ ماوەی ١٢ ساڵ لەعێراق دەرکرد. دواتر مەنوچێهر بەسەریا سەرکەوت وئەوەی لەوڵاتەکەی خۆی دەرکرد و گەرایەوە بۆ سەر پاشایەتی و دوای ئەوە بیست و هەشت ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد.

مونوچێهریان بە دادپەروەری و چاکەکاری وەسف کردووە. یەکەم کەس بوو سەنگەر(خەندەق)ی هەڵکەند و ساز و بەرگی رەزمی کۆکردەوە. یەکەم کەس بوو ئایینی دێداری(جوتیاری) دانا و بۆ هەر دێهاتێك دێدارێکی دانا و خەڵکی بۆ فەرمانبردن لەو هاندا. دەڵێن موسا لەشەستەمین ساڵی فەرمانرەوایەتی ئەو دەرکەوت.

کەسانیتر جگە لەهوشام کوڕی کەلبی دەڵێن: کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، لەشکری بۆ توران زەوی کێشا و داوای خوێنی باوەگەورێی خۆی ئیرەج کوڕی فەرەیدونی کرد.

تور کوڕی فەرەیەدون و براکەی سەلەمی کوشت. دواتر ئەفراسیاب کوڕی فشەنج (پوشەنگ) کوڕی ڕۆستەمی تورك – یانی ئەوەی تورکەکان لەنەژادی ئەو و لەمناڵەکانی تور کوڕی فەرەیدون لەدایك بوون- دوای کوژرانی تور بەدەست مەنوچێهر، شەڕی لەگەڵ کرد و لەتەبەرستان گەمارۆیدا و لەهەموو لایەکەوە ڕێگاکانی لێ گرت. ئەوکات ئەم دووانە لە سەر ئەوە ڕێکەوتن سنوری نێوان دوو وڵاتەکەی خۆیان بەتیری یەکێك لەپیاوەکانی مەنوچێهر دیاری بکات کەناوی ئیرەشی (ئارەش)بوو. تیری ئەو ڕێگەیەکی دوور و درێژی دەبڕی. ئەو تیرێکی لەتەبەرستانەوە هاویشت کە لەبەلخ هاتەخوار و روباری ئەوێ سنوری نێوان وڵاتی تورکان لەمناڵەکانی تور لەگەڵ مەنوچێهر دیاری کرا.

دەڵێم: ئەمە سەرسورهێنەرترین درۆیە ئێرانییەکان لەناو خۆیاندا باسی دەکەن کەتیرێك بتوانێت ئەم ڕێگا دوور ببڕێت.

دەڵێن: مەنوچێهر لەروبارەکانی دیجلە و فورات و روباری بەلخ، روباری گەورەی جیاکردەوە و فەرمانی ئاوەدانی زەوی دەرکرد. دەڵێن: تورکەکان لەسی و پێنج ساڵی پاشایەتی ئەو هێرشیان کردە سەر وڵاتەکەی و خەڵکان و زەوییەکانیان زەوت گرت. ئەو خەڵکی خۆی سەرکۆنە کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، هەموو خەڵکان لەنەژادی ئێوە نین. مرۆڤ تا کاتێك شیاوی ناو ونیشانی مرۆڤایەتییە کەخۆیان بناسن و دوژمنەکانی خۆیان دوور بکەنەوە. تورکەکان بەشێك لەوڵاتی ئێوەیان داگیر کردووە و ئەم کارە تەنیا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کەئێوە شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنتان پشت گوێ خستووە. خوا ئەم سەرزەوییە بەربڵاوەی بەئێمە بەخشیوە تا تاقیمان بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێت سپاسی دەکەین یا ناسپاسی، تا لەسەر ئەم بنەمایە سزا یا پاداشتمان بدات. کاتێك هەتاو هەڵهات، هەمووتان کۆببنەوە.

خەڵکان و گەورەکان کۆبوونەوە و مەنوچێهر لەسەر هەردو پێ وەستا و خەڵك – بۆ ڕێزی ئەو – هەستانە سەرپێ. مەنوچێهر وتی: دانیشن، بۆیە هەستام تا دەنگی خۆم بەگوێی هەمووتان بگەیەنم. خەڵکان دانیشتن. مەنوچێهر وتی: ئەی خەڵکینە،

ئافرێنراوەکان بەندەکانی ئافرێنەرن، سوپاس کردن و ملکەچ بوونی شیاوە. ئەوەی دەبێت رووبدات بەناچار دێت. کەس ناتەوانتر لەنافرێنراو نییە ح خوازیار بێت ح بانگ کراو. کەسیش بەتواناتر لەئافرێنەر نییە و بەتواناتر لەکەسێك نییە داواکەی لەدەست نەودابێت. هەروەها کەس ناتەوانتر لەو کەسە نییە لەدەستی داواکاری خۆی گرفتار بێت. زانستخوازی، رووناکییە و نائاگایی تاریکی و گومرایی و نەزانی. پێشینیان رۆشتوون و داهاتووان بەناچاری دەبێت پەیوەستی ئەوان بن. خوا ئەم پاشایەتییەی بەئێمە بەخشیوە و لەبەر ئەمە تەنیا سپاسی ئەو دەکەین و داوای لێدەکەین رزگاری و راست کرداری و بەهێزی لەئەندێشە و بیرکردنەوەمان پێ ببەخشێت. بەناچار پاشا مافی لەملی دانیشتووانی ولأتەکەی هەیە و هاوولأتیانیش مافیان لەملی ئەودا هەیە.

مافی پاشا لەسەر ئەوان ئەمەیە فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و خوازیاری باشە بن بۆ پاشا و لەگەڵ دوژمنانی ئەو شەڕ بکەن. مافی ئەوان لەسەر پاشا ئەوەیە رۆژییەکانی ئەوان لەکاتی خۆیدا بەوان بدات چوونکە ئەوان تەنیا لەم رێگاوە رۆژگار بەسەر دەبەن و پاشا خەزێنەداری ئەوانە. مافی هاوولأتیان لەسەر پاشا ئەوەیە بەتێروانینەوە لەکاروباری ئەوان بروانێت و بە نەرمی هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکات و ناچاریان نەکات بەکارێك کە لەتوانایاندا نییە. ئەگەر گرفتاری یەخەیان بگرێت کەزیان لەمیوەکانیان بدات دەبێت قەرەبوویان بۆ بکاتەوە تا بتوانن ئەوەی لەدەستیان داوە ئاوەدانی بکەنەوە. ئەوسا ئەو ئەندازە کەبۆ ئەوان گران نەبێت لەماوەی یەك دوو ساڵدا لەوان وەربگرێت. ئاگادار بوونی پاشا لەسێ عادەت ناچارییە: دەبێت راستگۆ بێت و هیچ کات درۆ نەکات. بەخشەر بێت و سەختگیر نەبێت و لەکاتی تۆڕە بوون، خۆپارێز بێت چوونکە ئەو زاڵە و دەستەکانی ئاوەڵا. باج بەردەوام بەو دەگات و لەبەر ئەمە دەبێت ئەو ئەندازەی سەربازان و هاوولأتیان شیاون بۆی، لێیان درێغ نەکات. دەبێت بەخشین و چاوپۆشی لەتاوان زیاد بکات چوونکە پاشا یا سەرزەمینێك بەتواناتر لەو کەسە و لەو شوێنە نییە کەبەخشین و چاوپۆشین لەتاوان تیایدا زیاد و فراوان بێت. ئەگەر پاشا لەبەخشین بلەرزێت باشترە لەوەی

لەسزادا بلەرزێت.

تورکەکان چاوی تەماحیان بریوەتە ولأتەکەمان. هاوکاریمان بکەن کەهاوکاری خۆتان دەکەن. فەرمانم داوە کەرەستە و ساز وبەرگی شەڕ بخەنە بەردەست ئێوە و من لەراوێژکردن لەگەڵ ئێوە بەشداربم. من لەپاشایەتی ئەم ناوەم هەیە هاورێ لەگەڵ فەرمانبردنی ئێوە. پاشا کاتێك پاشایە فەرمانی لێ ببەن و ئەگەر لەفەرمانی ئەو نافەرمانی بکەن، کۆیلەیە و پاشا نییە. پێشکەوتووترین کەرەستە لەکاتی گرفتاری، خۆراگری و بەهێزی لەزانستخوازییە. کەسێك لەشەڕ لەگەڵ دوژمندا بکوژرێت، هیوایی بەخشینی خوایی بۆ دەخوازم. ئەم دنیایە شوێنی تێپەرینە کەزیندووان تیایدا بەند و باری خۆیان دەکەنەوە.

ئەمە، وتارێکی دوور و درێژە. دوای ئەوەی مەنوچێهر کۆتایی بەقسەکەی هێنا، خەڵکی بۆ سەر سفرە بانگ کرد. خواردیان و خواردیانەوە و سپاسگوزار و فەرمانبرداری ئەو بوون. پاشایەتی ئەو ١٢٠ ساڵ درێژەی کێشا.

کوڕی کەلبی گومانی کردووە رایش کەناوی ئەو حرس کوڕی قەیس کوڕی سەیفی کوڕی سەبا کوڕی یەعرەب کوڕی قەحتان بوو و دوای یەعرب کوڕی قەحتان پاشایەتی یەمەنی گرتەدەست، لەرۆژگاری مەنوچێهردابوو. بۆیە پێی دەڵێن (رایش) (نێومنجیگەر) لەبەر ئەوەی تالأنیی بەدەست هێنا و بردی بۆ یەمەن و لەوکاتەوە پێی وترا رایش. دواتر رۆشتە شەری هیندیەکان و لەوێ کوشتاری کرد و گرفتاری کرد و تالأنی زۆری دەست کەوت و گەرایەوە بۆ یەمەن. دواتر هێرشی کردە سەر دو کێوی تەی ، ئەنباری موسل و لەوێوە سوارەکانی خۆی (کە فەرماندەی ئەوان پیاوێك بەناوی شمر کوڕی عەتاف بوو) بۆ سەرزەمینی ئازەربایجان رەوانە کرد، کوشتاری کرد و دیلی گرت. هەموو کار و کردەوەکانی خۆی لەسەر دو بەرد نوسی. ئەو بەردەیان لەئازەربایەجان دۆزییەوە.

دوای ئەو ئەبرەهەی کوری هاتە سەر تەختی پاشایەتی و نازناوی ئەو (ذوالمنار) (

گوڵدەستەدار) بوو. بۆیە بەم نازناوە بانگیان کردووە چوونکە هێرشی کردە سەر سەرزەمینە رۆژئاواییەکان و لەقوڵای ئەو سەرزەمینانەدا پێشڕەوی کرد. وشکایی و دەریایی خستە ژێر پێ و لەونبوونی سوپاییەکانی خۆی لەکاتی گەڕانەوە ترسا و لەبەر ئەمە گوڵدەستەی دروست کرد تا ڕێگای پێ بدۆزنەوە. خەڵکی یەمەن گومان دەکەن ئەو کوڕەکەی، عەبد کوڕی ئەبرەهەی لەشەڕەکانیدا بۆ قوڵایی رۆژئاوا نارد کە تالآنی زۆری بەدەست هێنا و لەگەڵ ئەسیری زۆر، گەڕایەوە. ئەو مەترسییەکی سەرسورهێنەری بوو، خەڵکان لێی دەترسان و ئەویان ناوناوە (ذوالاذعار ). ئەبرەهە یەکێك لەپاشاکانی ئەوانە کە لە قوڵایی وڵاتەکاندا پێشڕەوی کرد.

بۆیە ئاماژەم بەپاشاکانی یەمەندا چوونکە دەستەیەك گومان دەکەن رایش لەسەردەمی مەنوچێهردا بووە و پاشاکانی یەمەن کاربەدەستانی شای شاکانی ئێران بوون.

## داستانی موسا و ئەژدای ئەو و ڕوداوەکانی ڕۆژگاری ئەو

دەڵێن : ئەژادی ئەو بەم شێوەیە: موسا کوڕی عیمران کوڕی یەسهەر کوڕی قاهس کوڕی لاوی کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم . لاوی بۆ یەعقوب لەدایك بوو و لەکاتێکدا هەشتا و نۆ ساڵ لەتەمەنی تێدەپەڕی و قاهیس بۆ لاوی لەتەمەنی چل و شەش ساڵیدا و یەسهەر بۆ قاهیس هاتە دنیا و ئەو شەست ساڵ بوو. عیمران بۆ یەسهەر لەدایك بوو و ساڵەکانی تەمەنی سەد و سی ساڵ درێژەی کێشا. دایکی موسا یوخابە بوو. هاوسەرەکەی سەفورا کچی شوعەیبی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

فیرعەونی میسر لەسەردەمی ئەو قابووس کوڕی مەسعەب کوڕی معاویە یار و هاورۆژگاری یوسفی دوەم بوو. ژنی ئەم فیرعەونە، ئاسە کچی موزاحیم کوڕی عوبەید کوڕی ریان کوڕی وەلید بوو. وەلید فیرعەونی یوسفی یەکەم بوو. کاتێك موسایان لای (دار) بۆ پێغەمبەری و ڕێبەری هەڵبزارد، ئاگاداریان کردەوە قابووس، فیرعەونی میسر، مردووە و براکەی وەلید کوڕی مەصعەب لەجێگەی ئەو دانیشتووە. تەمەنی ئەو درێژ بوویەوە.ئەو لەقابووس خراپتر و ستەمکارتر بوو. فەرمان بەموسا

درا لەگەڵ براکەی هارون وەك پێغەمبەر(د.خ) بڕواتە لای فیرعەون. کاتی لەدایك بوونی موسا تا هاتنەدەرەوەی منالّکانی ئیسرائیل لەمیسر هەشتا ساڵ بوو. دوای ئەوەی لەمیسر هاتەدەر و لەڕوباری نیل تێپەری، بەرەو بیابان بەرێکەوت. کاتی مانەوەی ئیسرائیلیەکان لەبیابان تا رۆشتنە دەرەوەیان لەگەڵ یوشع کوڕی نون چل ساڵی خایاند. بەم پێیە، لەکاتی لەدایك بوونی تا کاتی مردن تەمەنی موسا سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا.

عەبدوڵلە کوڕی عەباس و کەسانیتر- کە گێرانەوەکانیان هاوشێوەی یەکترە- دەڵێن: خوای گەورە گیانی یوسفی گرت و پاشاکەی هاورۆژگاری ئەوی، لەناوی برد. فیرعەونەکان پاشایەتی میسریان پشتاوپشت بۆ دەمایەوە. خواوەند ژمارەی منالّەکانی ئیسرائیلی زیاتر کرد و بەدرێژایی ئەم زەمانە بەردەوام منالّەکانی ئیسرائیل لەژێر ستەمی فیرعەونەکان دەچەوسانەوە و پاشماوەی دینەکەی خۆیان دەپاراست. ئەم پاشماوە، ئەو بەشانە بوون لەوەی یوسف و یەعقوب و ئیسحاق و ئیبراهیم بۆ ئەوان وەك ئایینێکی خوایی بناغەیان بۆ داڕشتبوو. ئەم پاشایەتییە درێژەی کێشا تا فیرعەونی موسا هاتە سەرکار.ئەو یاخیترینی ئەوان لەبەرامبەر خوا و بەختەوەرترینی ئەوان و تەمەنێکی درێژی پێبڕابوو. ناوی، بە پێی ئەوەی ئاماژەی پێدرا، وەلید کوڕی مەسعەبە. ئەو بەستەم و سەختگرتن لەسەر منالّەکانی ئیسرائیل فەرمانڕەوایەتی دەکرد وئەوانی دەکردە کۆیلە و ئەشکەنجەی سەختی پێدەدان.

خوا مەبەستی ڕزگار کردنی ئەوانی کرد. موسا گەشەی کرد و گەورە و وەك پێغەمبەر هەڵبژێردرا. داستانی فیرعەون پێش لەدایك بوونی موسا بەم شێوەیە: لەخەودا بینی ئاگرێك لەبیت المقدسەوە هات و هەموو خانوەکانی میسری گرتەوە و قبتیەکانی سوتاند و زیانی لەمنالّەکانی ئیسرائیل نەدا. ئەو جادوگەران و فالگیران و کاهینەکانی کۆکردەوە و خەوەکەی خۆی بۆ گێرانەوە. وتیان: لەم شارە کەبیت المقدس بێت و منالّەکانی ئیسرائیل لەوێوە هاتوون، پیاوێك دەردەکەوێت و لەناوچوونی میسر لەسەر دەستی ئەو ئەنجام دەدرێت. ئەو فەرمانیدا هەر منالّێك بۆ منالّەکانی ئیسرائیل هاتە دنیا، دەست بەجێ بیکوژن وکچەکان بەزیندوویی

بهێڵنەوە.

دەڵێن: کاتێك زەمانی موسا نزیك بوویەوە، ئەستێرەناسەکانی فیرعەون هاتنە لای و پێیان وت: ئێمە لەزانستەکەی خۆمان بەم شێوە دەبینین منداڵێك لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل لەدایك دەبێت کەهاوڕۆژگاری پاشایەتی تۆیە و ئەو پاشایەتی لەدەست تۆدەردێنێت و بەسەر وڵاتەکەی تۆ زاڵ دەبێت و ئایینەکەی تۆ دەگۆڕێت. ئەو فەرمانیدا هەموو کورەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل بکوژن.

دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبوو بەڵکو فیرعەون و هاونشینەکانی لەبارەی موژدەی خوای گەورە بەئیبراهیم (کە پاشاکان و پێغەمبەرەکان لەبنەماڵەی ئەو دەبن) گفتوگۆیان کرد. یەکێك لەناو ئەوان وتی: منداڵەکانی ئیسرائیل چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە دەکەن. ئەوان پاشا و پێغەمبەریان بەیوسف کوڕی یەعقوب دەزانی بەڵام کاتێك ئەو مرد، وتیان: موژدەی خوا بۆ ئیبراهیم بەم شێوە نەبوو (ئەمە ئەو کەسە نییە خوا موژدەی هاتنی بەئیبراهیم داوە). فیرعەون وتی: لەم کارەدا چی دەبینن؟ هەموویان باوەڕیان وابوو هەموو لەدایك بووانی کوڕی منداڵەکانی ئیسرائیل بکوژن. بەقیبتیەکانی وت: ئەو کۆیلانەی لەدەرەوە هەتانە ، بهێنە ناو و کاری ئەوان بەمنداڵەکانی ئیسرائیل بسپێرن. منداڵەکانی ئیسرائیلی بۆ کاری کۆیلەکانی ناچار کرد. خوای گەورە دەفەرمێت: فیرعەون لەسەر زەوی ئاڵای گەردنکێشی و یاخی بوونی بەرز کردەوە و خەڵکانی میسری کردە دەستە دەستە و دەستەیەك لەوانی ریسوا کرد بەوشێوەیەك کەکوڕەکانی ئەوانی سەردەبڕی و کچەکانی بەزیندویی دەهێشتەوە. ئەو لەخراپەکاران بوو(قصص/٢٨/٤). فەرمانیدا هیچ منداڵێکی نێرینە لەمنداڵەکانی ئیسرائیل لەدایك نەبێت مەگەر ئەوەی سەری ببڕن. فەرمانیدا ژنانی دووگیان ئەشکەنجە بکەن بۆ ئەوەی منداڵیان ببێت یا منداڵەکانیا لەبار ببەن. قامیشی دەقەڵیشاند و ژنانی لەسەر دادەنیشاند. قاچی ئەوانی دەبڕی. ژنێك کەمنداڵی دەهێنایە دنیا لەتاو ئازار، منداڵەکەی دەکردە قەڵغانی خۆی. لەولاوە خواوەند مەرگی لەناو پیرەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل بڵاو کردەوە. دواتر گەورەکانی قیبت هاتنە لای فیرعەون و گفتوگۆیان لەگەڵدا کرد و وتیان: مەرگ لەناو ئەم خەڵکەدا بڵاو بۆتەوە و

بەم نزیکانە قورسایی کاروبارەکان دەکەوێتە سەرشانی کۆیلەکانی ئێمە. تۆ منالەکان دەکوژی و مەرگ گەورەکان دەباتەوە. تکا دەکەین هەندێ لەمنالەکانی ئەوان بەزیندویی بهێڵیتەوە. فیرعەون فەرمانیدا یەك سالْ منالی کوڕ بکوژن و یەك سالْ نەیانکوژن. کاتێك سالی سەرنەبڕان هات، هارون لەدایك بوو و کاتێك سالی سەربڕان گەشت، موسا چاوی بەدنیا هەڵهێنا. کاتێك دایکی ویستی موسا بێنێتە دنیا، خەمبار بوو بەلاَم خوا خستبوویە دڵییەوە: شیری پێبدە و ئەگەر لەو دەترسیت بیخەرە دەریا – یانی نیل= خەمبار مەبە، ئێمە بۆ تۆی دەگەرێنینەوە و دەیکەینە پێغەمبەر(د.خ) (قصص/٧/٢٨).

کاتێك دایکی ئەوی هێنایە دنیا، شیری پێدا و ئەوسا دارتاشێکی بانگ کرد تا سنوقێکی بۆ دروست بکات و کلیلەکەی خستە ناو سنووقەکە. دایك، موسای کردە ناوی و خستیە ناو زەریا. کاتێك منالْ لەبەرچاوی دایك دیار نەما، ئیبلیس هاتە لای و ترسی لای دایکی موسا دروست کرد. دایك بەخۆی وت: چ کارێك بوو لەگەلْ خۆمدا کردم. ئەگەر لەبەر چاوی خۆم سەریان دەبڕی وخۆم کفن و دفنم دەکرد باشتر لەوە بوو بیخەمە ناو قورگی خزۆك و ماسییەکانی دەریا. کاتێك خستیە ناو دەریا بەکچەکەی مریەمەی وت بەدوایدا بڕوات.خوشکەکەی موسا لەدوورەوە بینی و فیرعەونییەکان نەیاندەزانی ئەو خوشکی موسایە ((قصص/١١/٢٨)). شەپۆل سنوقەکەی لەخۆیدا دەبرد، بەرز و نزمی دەکردەوە تا بردییە لای ئەمامستانێك نزیك بارەگای فیرعەون. کەنیزەکانی ئاسیەی ژنی فیرعەون بۆ مەلە کردن رۆشتنە دەر و سنوقەکەیان دۆزییەوە و هێنایان بۆ لای ئاسیە. گومانیان کرد شتێکی گرانبایی تێدایە. کاتێك سنوقەکەیان کردەوە و ئاسیە لەمنالەکەی ڕوانی، خۆشەویستی کەوتە دڵییەوە. بەفیرعەونی وت: مەیکوژن ئەگەری هەیە سوود بەئێمە ببەخشێت یا وەك منالی خۆمان هەڵیبگرینەوە. نەیاندەزانی ئەمە موسایە کەلێی دەترسن (قصص/٩/٢٨).

فیرعەون وتی: کوری تۆ بێت، من پێویستم پێی نییە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سوێند بەو کەسەی سوێندیان پێ خواردووە ئەگەر فیرعەون رازی بووایە بەوەی موسا روناکی چاوی بێت، خوا ئەوەی بۆ رێگای راست رێنویی دەکرد بە هەمان شێوە کە ئەو ژنەی رێنوێنی کرد.

فیرعەون ویستی سەری ببڕێت بەلاّم ئاسیە بەردەوام قسەی بۆ دەکرد تا ئەوەی کوڕەکەی تەسلیم کرد. فیرعەون وتی: دەترسم لەمناڵەکانی ئیسرائیل بێت و ئەوکەس بێت کە لەناوچوونی ئێمە لەسەر دەستی ئەوە. ئەمە هەمان وتەی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی: کەسانی فیرعەون ئەویان لەناو هێنایەدەر تا دوژمن و هۆکاری خەمی ئەوان بێت. بەلاّم فیرعەون و سوپاییەکانی لە لارێکان بوون (قصص:٨/٢٨). ژنانی شیردەریان هێنا بەلاّم مەمکی هیچ کامیانی نەگرت. خواوەند دەفەرمێت: پێش ئەو مەمکی چەندین دایکیترکان خستەبەردەم و ئەومان لەوان دوور خستەوە. خوشکەکەی موسی – مریەم – وتی: ئایا ناونیشان بنەماڵەیەك بەنێوە بدەم کەبیگرنە خۆ و ئەوان خوازیاری بەختەوەری بن؟ (قصص/١٢/٢٨).فیرعەونییەکان گرتیان و پرسیان: لەکوێوە دەزانیت ئەوان چاکەی ئەمیان دەوێت؟ ئایا دەیناسن؟ گومانیان لەموسا کرد. مریەم وتی: چاکەخوازی وچاك بوون لەگەڵ ئەم کوڕە حەزی ئەوان بۆ ئەنجامدانی خواستی پاشا و هیوای دەسکەوتنی داهاتە. مریەم رۆشتە لای دایکی موسا وئەوی ئاگادار کردەوە. دایکی هات و مەمکی خستە دەمیەوە. موس بەخێرایی لەشیری دایکی خوارد و نزیك بوو دایك بقیژێنێت: کورەکەم! بەلاّم خوا رێگەی ئەم کارەی لێگرت.

بۆیە ناویان ناوە موسا لەبەر ئەوەی لەنێوان ئاو و دار دۆزرایەوە چوونکە (مو) لەزمانی قیبتی بە مانای ئاو و (سا) بە مانای دارە. ئەمە هەمان وتەی خوای گەورەیە کەدەفەرمێت: ئێمە ئەومان بۆ دایکی گەڕاندەوە تا چاوی روناك بێت و خەمبارنەبێت و بزانێت موژدەی خوا راستە و زۆربەی خەڵك ئەم راستییە نازانن(قصص/١٣/٢٨).

ونبوونی ئەو لەداوێنی دایکی بۆ ماوەی سێ رۆژ بوو. دایك ئەوی لەگەڵ خۆیدا بۆ

ماڵ بردەوە و فیرعەون وەك كوڕی خۆی هەڵیگرتەوە و خەڵك بەموسا كوڕی فیرعەونیان دەناسی. كاتێك منداڵ توانی بەرێگادا بڕوات، دایكی هێنایەوە بۆ لای ئاسیە. ئاسیە گرتی و هەڵیدەپەڕاند و گەمەی لەگەڵ دەكرد. ژن دایە دەستی فیرعەون و كاتێك فیرعەون لەئامێزی گرت موسا دەستی بۆ ڕیشی برد و هەڵیكەند. فیرعەون فەرمووی: جەلادەكان بێنن تا سەری ببڕێت. ئەمە ئەو كەسەیە لێی دەترسام. ئاسیە وتی: مەیكوژن، وەك منداڵی خۆمان هەڵیدەگرینەوە بەڵكو سوودمان پێ بگەیەنێت (قصص/٩/٢٨). ئەو منداڵە و چاكە لەخراپە جیاناكاتەوە وئەم كارەی لەڕوی نەزانییەوە كرد. تۆ دەزانی لەسەراسەری میسر ژنێك پڕزێڕ و زیوتر لەمن نییە. من یاقوت و ئاگری بۆ دەخەمە پاڵ یەك و لێی نزیك دەكەمەوە. ئەگەر یاقوتەكەی هەڵگرت بزانە زانایە و وشیار و تۆ دەتوانیت سەری ببڕیت و ئەگەر ئاگری هەڵگرت بزانە منداڵێكی نەزانە. ژن یاقوتی بۆ هێنا و ئاگری لەناو تەشتێكدا لەڕوبەڕوی دانا. لەم كاتەدا جبرەئیل هاتە خوار و دەستی خستە سەر ئاگرەكە. موسا كەمێك لەئاگرەكەی هەڵگرت و لەدەمی نزیك كردەوە. دەمی سوتا (و لەوە بەدوا زمانی گیرا). ئەمە ئەو بابەتەیە خوای گەورە لەزمانی موسا باسی دەكات كە بەخوای وت: چارەسەری زمان گیرانی من بكە تا خەڵك لەقسەكانم تێبگەن (طة /٢٠/٢٧).ژن بەم كارەی كوژرانی لەموسا دوور خستەوە.

موسا گەورە بوو. ئەو سوار ئەسپەكەی فیرعەون دەبوو و جل و بەرگی ئەوی لەبەر دەكرد. بەموسا كوڕی فیرعەون بانگیان دەكرد. منداڵەكانی ئیسرائیل لەپەنای ئەودا لەزیان دوور كەوتنەوە. ئیتر قیبتیەك نەبینرا ستەم لە منداڵەكانی ئیسرائیل بكات. قیبتییەكان لەموسا دەترسان.

بەرێكەوت فیرعەون سوار ئەسب بوو بێ ئەوەی موسای لەگەڵدا بێت. كاتێك موسا هات، پێیان وت: فیرعەون ڕۆشتووە. موسا سوار بوو و بەدوایدا ڕۆشت. لەسەرزەمینێك كەپێیان دەوت مەنف –كە میسری باستان و شوێنی یوسفی ڕاستگۆ و ئێستاكە دێهاتێكی گەورەیە – دابەزی و كەمێك حەوایەوە. نیوەڕۆ هات و بازارەكانیان داخست. موسا لەبێ ئاگایی خەڵكی ئەو شارەدا ڕۆشتە ناویان و لەوێ

دوپیاوی بینی شەڕیان دەکرد. یەکیان لەشوێن کەوتوانی موسا (ئیسرائیلی) و یەکیتریان لەدوژمنەکانی (قیبتی)بوو. ئەوەی شوێنکەوتوی موسابوو، داوای هاوکاری لەموسا بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکەیدا کرد(قصص/١٥/٢٨). دەڵێن: ئەم کەسە ئیسرائیلی و دەڵێن سامەری بووە و ئەویتریان لەقیبتیەکان. موسا لەمکارە توورە بوو چوونکە قیبتیەکە پەلاماری ئیسرائیلیەکەی دا و دەیزانی ئیسرائیلیەکان چ پێگەیەکیان لای موسا هەیە و موسا چۆن پارێزگاریان لێدەکات. ئەو بەردەوام ئەوانی لەبەرابەر قیبتیەکان پاراستبوو. خەڵك خۆیان نەیاندەزانی ئەو لەئیسرائیلیەکانە بەڵکو گومانیان دەکرد ئەم لایەنگیریە لەبەر ئەوەیە لەشیری ئەوانی خواردووە. کاتێك زیاد لەرادە توورە بوو، مشتی لەقیبتیەکەدا و دەسبەجێ کوشتی. دواتر بەخۆی وت: ئەمە لەکرداری دێو بوو و دێو بۆ مرۆڤ دوژمنێکی ئاشکرایە. موسا وتی: خوایە ستەمم لەخۆم کرد، لەمن خۆشبە، خوا ئەوەی بەخشی چوونکە گەورەترین بەخشەندەیە(قصص/١٧/١٥/٢٨). خوا خستیە دڵی موساوە: سوێند بە گەورەیی خۆم، ئەگەر ئەو پیاوەی کوشتت یەك سات پشتی بەخوایەتی من ببەستایە کە رۆژیدەر و نافرێنەرم بەئەشکەنجەیەکی سەخت گرفتارم دەکردی. موسا وتی: خوایە بەو بەخشینەت، ئیتر هیچ کات پشتیوانی خراپەکاران نابم. موسا شەوی کردە رۆژ و ترساو لەناو شاردا دەگەرا. دەترسا بیگرن. بینی ئەو پیاوەی دوێنێ داوای هاوکاری لێدەکرد ئێستا بەناو بانگی دەکات. موسا وتی: تۆ پیاوێکیت بەئاشکرا گومڕا. موسا روی تێکرد تا هاوکاری بکات. کاتێك ئەو پیاوە موسای بینی بەرەو لای دەڕوات و مەبەستی ئەو پیاوەی کردووە کە شەڕی لەگەڵ ئیسرائیلیەکەدا کردووە ، ترسا بیکوژێت چوونکە موسا بە دەنگی بەرز و توورەیی قسەی لەگەڵدا کردبوو.

لەبەر ئەمە ئەو (یا قیبتییەکە) وتی: ئایا دەتەوێت پیاوێك بکوژیت بەهەمان شێوە کەدوێنێ پیاوێکت کوشت؟ ناتەوێت مەگەر ئەوەی ستەمکار و یاخی لەسەر زەوی بیت و هەرگیز نەتەوێت بچیتە ریزی چاکەکاران. موسا قیبتیەکەی بەرەڵا کرد و رۆشت و بڵاوبوویەوە کەموسا ئەو پیاوەی کوشتووە. فیرعەون بەدوایدا گەرا و وتی: بیگرن چوونکە ئەو کەسەیە بەدوایدا دەگەڕێین. پیاوێك هاتە لای موسا لەدوورترین

شوێنی شارەکە. وتی: ئەی موسا، گەورەکانی شار راوێژ دەکەن تا بتکوژن. لەشار بڕۆرەدەر، من چاکەخوازی تۆم (قصص/١٨/٢٨——٢٠).

دەڵێن: ئەم پیاوە خەربیل (حەزقیل) باوەرهێنەری بنەماڵەی فیرعەون بوو (باوەرداری بنەماڵەی فیرعەون) کە لەسەر پاشماوەکانی ئایینی ئیبراهیم دەژیا. ئەو یەکەم کەس بوو باوەڕی بەموسا هێنا. کاتێك موسای لەو کارە ئاگادار کردەوە، موسا ملی رێگەی گرتەبەر. ترساو بوو و چاوەروانی بەلاّ و گرتنی دەکرد. وتی: خوایە لەدەستی ستەمکاران رزگارم بکە وجیابکەرەوە (قصص/٢١/٢٨). موسا لەکوێرە رێکانەوە بەرێکەوت تا کەس نەیبینێت. لەم کاتەدا فریشتەیەك هاتەخوار کە لەدەستیا (عەنزە) کەرەستەیەکی شەڕی بچوك بوو. موسا لەترسا لەبەرانبەریدا سەری دانەواند و کورنوشی برد. فریشتە وتی: کورنوش بۆ من مەبە بەڵکو بەدوای مندا وەرە. فریشتە بەرەو شاری مەدیەن رێنویی کرد، کاتێك روی کردە مەدیەن، وتی: خوا رێگەی راست بەمن نیشان دەدات (قصص/٢٢/٢٨). فریشتە ئەوی برد و گەیاندیە مەدیەن. ئەو بەرێکەوتبوو بێ ئەوەی توێشو و خواردنی هەڵگرتبێت. لەبەر ئەمە گەلاّی داری دەخوارد و توانای رێگە رۆشتنی لێبڕابوو. هەرئەوەندەی گەشتە مەدیەن، لەپێ کەوت، کاتێك گەشتە سەر ئاوی مەدیەن، کۆمەڵێك خەڵکی بینی کەمەڕەکانی خۆیان ئاو دەدا. لەخوار پیاوەکان دو ژنی بینی مەرەکانی خۆیان لەئاوەکە دوور دەکردەوە. ئەم دوو ژنە کچانی شوعەیبی پێغەمبەر(د.خ) بوون. دەستەیەك دەڵێن کچانی یەسورن بوون و ئەو برای شوعەیب بوو. کاتێك موسا ئەوانی بینی: وتی ئەم چ کارێکە ئێوە دەیکەن؟ وتیان: مەرەکانی خۆمان ئاو نادەین تا ئەو کاتەی شوانەکان دەگەرێنەوە و مەر و ماڵاّتی خۆیان ئاو دەدەن. باوکی ئێمە پیرەپیاوێکی بەتەمەنە (قصص/٢٢/٢٨——٢٣). موسا دڵی بۆیان سوتا. هاتەسەر چاڵی ئاوەکە و تاشەبەردێکی لێ هەڵگرت کەکۆمەڵێك لەخەڵکی شار لەسەری کۆدەبوونەوە تا لەشوێنەکەی هەڵبگرن. موسا مەڕەکانی ئەوانی ئاودا. ئەو دووانە بەخێرایی گەڕانەوە و بەردەوام لەئاوی پاشماوەی ئاوگیرەکان مەرەکانی خۆیان ئاودەدا. موسا رویکردە دارێك تا لەسێبەرەکەیدا بحەسێتەوە. دواتر وتی: خوایە، بەهەر باشەیەك

بۆ منی دەنێرێت، نیازمەندم (قصص/٢٨/٢٤). عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: موسا ئەم قسەی لەکاتێکدا کرد کەئەگەر کەسێك دەیویست سەوزە گیا—لەتاو برسیەتی—لەسکی ببینێت، دەیدی. موسا داوای یەك تیکە نانی لەخوا کرد و بەس.

کاتێك دوو کچەکە بەخێرایی بۆ لای باوکیان گەڕانەوە، لەهۆکارەکەی پرسی و ئەوان بەسەرهاتەکەیان بۆ گێرایەوە. باوك یەکێك لەو دوو کچەی گەڕاندەوە و موسای بۆ ماڵەکەی خۆی بانگێشت کرد. لەم کاتەدا یەکێك لەو دوو کچە گەرایەوە لای موسا و بەرێدا دەڕۆشت بەشەرمەوە. بەموسای وت: باوکم داوای تۆ دەکات تا کرێی ئەو ئاودانی مەڕەکانی ئێمەت پێبدات (قصص/٢٨/٢٥). موسا هەستا و لەگەڵیا بەرێکەوت. ئەو لەپێش موسا دەڕۆشت، باهەڵیکرد و جلەکانی ئەوی بەرز کردەوە و سمتی دەرخست. موسا وتی: لەپشت سەری من وەرە و رێگەم نیشان بدە چوونکە ئێمە لەبنەماڵەیەکین سەیری دواوەی ژنان ناکەین.

کاتێك موسا هات و داستانی خۆی بۆ باوکی کچەکان گێرایەوە، باوك فەرمووی: مەترسە لەو دەستە ستەمکارە رزگارت بووە. یەکێك لەو دوو کچە – ئەوەی ببوو بەرێنیشاندەری موسا- وتی: ئەی باوکە، کاری پێبدە چوونکە باشترین کەسێك کاری پێبدەی ئەمەیە، پیاوێکی بەهێز و راست کردارە(قصص/٢٨/٢٥—٢٦). باوك وتی: بەهێزیت بینی، چاکەکاری ئەوت لەکوێ بینی؟ کچ داستانی گەڕانەوەی بۆ ماڵ باس کرد کەموسا لەدواوی ئەوەوە بەرێگەدا دەڕۆشت. باوك وتی: دەمەوێت یەکێك لەم دوو کچەم بکەمە هاوسەری تۆ بەو مەرجەی هەشت ساڵ کرێی کرێکاری خۆت، وەك مارەیی خۆت بەمن بدەیت – هەشت ساڵ بۆ من کار بکەیت – ئەگەر بیکەی بە دەساڵ، ئەوە هی تۆ دەبێت. نامەوێت رەنجی زۆر بخەمە سەرشانی تۆ و یا بارودۆخ لەسەر تۆ دژوار بکەم. بەخواستی خوا من لەچاکەکاران دەبینی. موسا پێی وت: ئەمە لەنێوان من و تۆ بێت کە هەریەك لەرۆژەکانم لێرە بەسەر ببەم، زیادە ویستن لەمن نەبێت و خوا بەوەی دەیڵێم کارسازە (قصص/٢٨/٢٧—٢٨). موسا ئەو رۆژە لای ئەو مایەوە. کاتێك شەو داهات، شوعەیب شێوی هێنا بەڵام موسا لەخواردن خۆی دوور خستەوە. شوعەیب وتی: بۆنەتخوارد؟ موسا وتی: لەبنەماڵەیەکم کەمێك لەکاری ئەو

دنیا بەهەموو کاری ئەم دنیا ناگۆڕمەوە. شوعەیب وتی: بۆ پاداشتی ئاودانەکەی تۆ نییە خواردن بەتۆدەدەم. ئەمە خوی من و باوکانی منە. موسا خواردی و دڵدانی شوعەیب بۆ موسا زیادی کرد. لەبەر ئەمە ئەو کچەی کردە هاوسەری موسا کەرێگەی ماڵەوەی نیشاندا. ناوی سەفورا بوو. شوعەیب پێی فەرموو، داردەستی بۆ بێنێت و دایە دەست موسا. ئەم داردەستە فریشتەیەك لەروخساری پیاوێك بەوی سپاردبوو. سەفورا دایە دەست هاوسەرەکەی خۆی. کاتێك باوك ئەوەی بینی، پێی وت ئەوە بگەڕێنێتەوە و یەکێتر بێنێت. کچ بردی و داینا و ویستی یەکێتر بێنێت بەڵام جگە لەوە دەستی بەرهیچیتر نەدەکەوت. شوعەیب چەندین جار ئەوی گەڕاندەوە بەڵام دووبارە ئەو داردەستە بەردەستی دەکەوت. موسا وەریگرت تا کاری شوانی پێبکات و شوعەیب لەبردنی ئەو داخی خوارد و رۆشتە دەر تا لێی وەربگرێتەوە چوونکە ئەو داردەستە سپێردراوی خوایی بوو. کاتێك موسا بینی دەیەوێت داردەستەکەی لێوەربگرێتەوە، تەسلیمی نەکردەوە. ئەو دووانە لەسەر ئەمە رێکەوتن یەکەم پیاو کەبینیان بکەنە داوەر لەنێوان خۆیان. لەمکاتەدا فریشتەیەك لەروخساری پیاوێك هاتەخوار و بەم شێوەیە داوەری کرد کەموسا داردەستەکە دابنێت و هەرکەس توانی هەڵیبگرێت، هی ئەو بێت. موسا داینا و جگە لەموسا کەس نەیتوانی هەڵیبگرێ. شوعەیب داردەستەکەی بەو سپارد. ئەوداردەستە لەداری (عەوسەج)ە (دارێکی دڕکاوی هاوشێوە هەنار) دوو لق و سەرەکەی چەماوە بوو. دەڵێن: ئەو داردەستە لەئاس یا مەوریدی بەهەشتی بوو کەئادەم لەگەڵ خۆیدا هێنای. لەبارەی ئەو داردەستەگێرانەوەی تریان ئاماژە پێداوە.

موسا بۆ ماوەی دەساڵ لای شوعەیب مایەوە و شوانی بۆ دەکرد. ئەوسا ژنەکەی خۆی لەکاتی زستان و سەرمای سوتێنەر هەڵگرت و بەرێکەوت. کاتێك ئەو شەوە هات کەخوای گەورە دەیویست بەخشینە تایبەتەکانی خۆی بەموسا ببەخشێت و بۆ پێغەمبەری هەڵیبژێرێت و قسەی لەگەڵدا بکات، موسا رێگەی ون کرد بەشێوەیەك نەیدەزانی بۆ کوێ دەروات.

ژنەکەی دووگیان بوو، ژانی مناڵبوون ئەوی گرتەوە، شەوێکی بارانی و ئاسمان هەورە

بروسكەی دەباراند. موسا سوتەمەنی دەرهێنا تا بۆ كەسانی خۆی ئاگرێك دروست بكات بۆ ئەوەی گەرم ببنەوە و شەو بكەنە رۆژ و رێگا بدۆزێتەوە. سوتەمەنی ئەو دانەدگیرسا. ئەوەندی بەرد و ئاسن لەیەك سوو كەوزەی لێبڕا. لەم كاتەدا نورێكی بینی و بەئاگری زانی. ئەو روناكییە، دەلاقەیك لە نووری خوا بوو.

موسا بەخێزانەكەی خۆی وت: كەمێك چاوەرێ بن، ئاگرم بینی. ئەگەری هەیە بەشتێكەوە بۆ لای ئێوە بگەرێمەوە یا كەمێك ئاگر لەگەڵ خۆمدا بێنم تاخۆتانی پێگەرم بكەنەوە (قصص/٢٨/٢٩). كاتێك نزیك ئەو ئاگرە بوویەوە، بەنورێكی گەورەی بینی كە لەئاسمان تا لقەكانی دارێكی ئەستوور لەعەوسەج درێژ ببوویەوە. دەستەیەكیتر دەڵێن: ئەودارە داری عەناب بوو. موسا پەرێشان و ترسا چوونكە ئاگرێكی بینی بێ دوكەڵ دەسوتا و لەسەر دارێكی سەوز بڵێسە دەسەند. ئاگەر سات بەسات گەورەتر دەبوو و دارەكە سات بەسات سەوزتر. كاتێك لێی نزیك بوویەوە، ئاگرەكە خۆی دەكشانەدەوە. موسا ترسا و گەرایەوە. ئەوسا لەودارەوە بەناو بانگیان كرد و كاتێك ناوی خۆی بیست، ئارام بوویەوە و گەرایەوە. كاتێك موسا گەرایەوە بۆ لای ئاگرەكە، بانگیان كرد. ئەویان لەبێكۆتایی روبار لەلای راست لەو شوێنەی دەسخۆشی كردووە لەو دارە كە: پیرۆزە ئەو كەسەی لەناو ئاگردایە و ئەو كەسانەی لەدەوروبەریدان، یا موسا من اللهم ئافرێنەری جیهانیان (قصص/٢٨/٣٠، نمل/٢٧/٧). كاتێك ئەو دەنگەی بیست و ئەو مەزنییەی بینی، دڵی كەوتە لەرزین، زمانی گیرا، هێزی سست بوو هاوشێوەی زیندوویەكی مردوو. خوا فریشتەیەكی بۆنارد تا دڵی بەهێز بكاتەوە. كاتێك ئاوزی بەدەست هێنایەوە، بانگیانكرد یا موسا: من خوای تۆم. پێلاوەكانت لەپێداكەنە چوونكە تۆ لەسەرزەمینێكی پیرۆزدایت كەبەرەكەتیان لەنێوانیدا بلاوكردۆتەوە و لەهەرلایەكەوە بلاویان كردۆتەوە(طة /٢٠/١٢). بۆیە فەرمانی داكەندنی پێلاوەكانیان پێدا چوونكە پێلاوەكانی لەپێستی كەرێكی تۆپیو بوو. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوەی قاچی دەخاتە سەر ئەو زەویە پیرۆزە. ئەوكات خوا بۆ ئارام كردنەوەی وتی: ئەو چییە لەدەستی راستی خۆتا ئەی موسا؟ وتی: داردەستەكەی منە كە وێستاو لەسەری دەخەوم و بەمە گەلای دار بۆ مەڕو

ماڵاتەکەی خۆم دادەتەکێنم – لە دارەکان دەدەم تا گەڵاکانی بووەرێن – پێویستی ترم پێیەتی، توێشو وئاودانی پێهەڵدەگرم (طة / ٢٠/١٧——١٨).

ئەو داردەستە لەشەودا دەدرەوشایەوە و دەوروبەری خۆی روناك دەگردەوە. کاتێك پێویستی بەئاو بووایە، دەیکردە ناوچاڵی ئاو و کاتێك بەئاو دەگەشت لەسەرەکەی دەفرێك هاوشێوەی سەتڵ دروست دەبوو و کاتێك ئارەزوی میوەی دەکرد، لەزەویدا دەیچەقاند، لق و گەڵای دەردەکرد و میوەیەکی ئەو وەرزەی بەرهەم دەهێنا.

خوا فەرمووی: فڕێبدە ئەی موسا. موسا فڕێدا و لەناکاو داردەستەکە بوو بەمارێکی گەورە کەهاوشێوەی پەرییەکان رایدەکرد و دەجوولا. کاتێك موسا ئەمەی بینی، بۆ دواوە گەڕایەوە و رایکرد و ئاوڕی نەدایەوە. بانگیان کرد: ئەی موسا مەترسە چوونکە پێغەمبەران لای ئێمە لەهیچ شتێك ناترسن (نمل/٢٧/١٠). بگەڕێرەوە و مەترسە کەدووبارە دەیکەینەوە بەشێوەی یەکەمی خۆی و دەیکەین بەداردەست. خوا بۆیە فەرمانی فڕێدانی داردەستەکەی پێدا تا ئەوکاتەی لای فیرعەون فڕێدەدات نەترسێت. کاتێك موسا گەڕایەوە، خوا فەرمووی: ئەو مارە بگرە و دەستی خۆت بکەرە ناو دەمیەوە. موسا باڵاپۆشێکی پەشمیی لەبەردابوو. دەستی خۆی کردە ناو قۆڵەکەی بەڵام بەوشێوەیش لێی دەترسا. بانگیان کرد: دەستت لەو قۆڵە بێنەدەر. دەستی لەقۆڵەکە دەرهێنا و خستیە ناودەمی مارەکە. کاتێك دەستی خۆی بردەناو، ئەو مارە بوو بەداردەستەکەی جاران و موسا هیچ گۆڕانکاری و ناسازگارییەکی نەبینی.

خوا فەرموو: دەست بکەرە ناو گیرفانی خۆت تا سپی، درەوشاوە و بێ پیسی بێتەدەر (نمل/٢٧/١٢). دەستی کردە گیرفانی و دەریهێنا و لەم کاتەدا دەستی وەك بەفر سپی بوو و نیشانێك لە پیسی لێنەدەبینرا و نووری لێدەدرەوشایەوە. دووبارە دەستی کردە گیرفانی و دەریهێنایەوە و دەستی بۆ هەمان شێوەی یەکەم خۆی گەڕایەوە. پێی وترا: ئەم دووانە (دەست وداردەستەکە) دو نیشانەی درەوشاوە لەخواکەی تۆن کە بەو دووانە دەرۆیتە لای فیرعەون و گەورە پیاوانی وڵات. ئەوان خەڵکێکی خراپەکار

بوون. موسا وتی: خوایە، کەسێکم لەوان کوشتووە دەترسم ئەوانیش بمکوژن. براکەم هارون لەمن باشتر دەتوانێت قسە بکات ئەو لەگەڵ مندا بنێرە تا یار و هاوڕێی من بێت و شایەتی بۆ راستی قسەکانم بدات — یانی براکەم قسەکەی من بۆ ئەوان رون بکاتەوە و تێیان گەیەنێت چوونکە ئەو تێدەگات چی دەڵێم و ئەوەی ئەوان لێی تێناگەن بۆیان رون دەکاتەوە. خوا فەرمووی: بازووی تۆ بەبراکەت بەهێزدەکەین و نیشانەیەکی روون لەراستیتان پێدەبەخشین و زاڵ بوونتان بۆ فەراهەم دەکەین و لەمە بەدوا لەبەرامبەر نیشانەکانی ئێمە بەسەر ئێوەدا زاڵ نابن. ئێوە دووانە و شوێن کەوتوانتان سەرکەوتووەکانن (قصص/٢٨/٣٢——٣٥).

موسا بۆ لای خێزانەکەی خۆی گەرایەوە وئەوانی بەرەو میسر برد و شەوانە رۆشتە ناو ئەو سەرزەمینە. بوو بەمیوانی دایکی خۆی. بنەماڵەکەی خۆی ناسیەوە بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسیەوە. هارون هات و لەدایکی پرسی ئەمە کێیە؟ دایکی ئاگاداری کردەوە کەمیوانە. هارون بانگی کرد و خواردنی لەگەڵ خوارد. هارون لێی پرسی: کێیت؟ وتی: موسا. ئەو دووانە یەکیان لەئامێز گرت. دەستەیەك دەڵێن: خوا موسای بۆ ماوەی حەوت رۆژ لەحاڵی خۆیدا بەجێهێشت و دواتر فەرمووی: وڵامی خوا لەبارەی ئەوەی قسەی لەگەڵ تۆدا کردووە، بدەرەوە. موسا وتی: خوایە، دڵی من فراوان بکە و کاری من ئاسان بکە و گرێ لەزمانی من وەکە تا لەقسەکانی من بگەن و لەکەسانی خۆم وەزیرێکم پێببەخشە، پشتی من بەهارونی برام بەهێز بکە و لەکارەکانی مندا بیکەرە شەریك، تا ئێمە بە پاکی وەسفی تۆ بکەین و بە فراوانی بیرت بکەینەوە. تۆ بەکار و چارەنوس ئێمە ئاگایت. خوا فەرمووی: خواستەکانت بەتۆ بەخشرا (طة/٢٠/٢٥–٣٦). خوا فەرمانی پێدا بڕواتە لای فیرعەون. کەسان و بنەماڵەکەی ئەو لەشوێنی خۆیاندا بوون و نەیاندەزانی چی بکەن تا ئەوەی شوانێك لەخەڵکی مەدیەن لایانەوە تێپەری وئەوانی لەگەڵ خۆیدا بردە ئەو شارە و بردنی بۆ ماڵی شوعەیب. ئەوان لەو شارەدا لای شوعەیب بوون تا ئەوەی بەسەرهاتی موسا و قەڵشانی دەریایان بیست و دواتر پەیوەستی بوون.

بەلام موسا، بەرەو میسر رۆشت. خوا وەحی بە هاروون کرد وئەوی ئاگادار کردەوە کەموسا گەڕاوەتەوە. خوا فەرمانی پێدا میوانداری موسا بکات. هارون لەمیسر هاتە دەر و چاوی بەموسا کەوت. موسا وتی: ئەی هاروون، خوای گەورە من و تۆی وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژاردووە. لەگەڵ مندا وەرە. هارون وتی: بیستم و فەرمانبردارم. کاتێك هاتە ماڵی هارون و وتیان دەرۆنە ماڵی فیرعەون، کچەکی هارون بیستی و دایکی ئەو دووانەی بە هاوار بانگ کرد. دایك وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا مەرۆنە لای فیرعەون چوونکە هەمووان دەکوژێت. گوێیان لەقسەی ئەو نەگرت و شەوانە کەوتنە رێ و لەدرگای ماڵی فیرعەونیان دا. فیرعەون بەدرگاوانەکەی خۆی وت: ئەمە کێیە لەم کاتەدا لەدرگای ماڵی من دەدات؟ دەرگاوان هات و لەسەرەوە سەیری ئەوانی کرد و قسەی لەگەڵدا کردن. موسا پێی وت: ئێمە نێردراوی خواوەندی جیهانیانین. دەرگاوان فیرعەونی ئاگادار کردەوە وبە دوای ئەو هارون و موسا رۆشتنە لای فیرعەون.

دەستەیەك دەڵێن: موسا و هارون دو ساڵ مانەوە و هەر رۆژ لەبەرەبەیانەوە تا شەو دەرۆشتنە دەرباری فیرعەون و داوایان دەکرد مۆڵەتیان بۆ وەربگرن تا برۆنە لای بەلام کەس نەیدەوێرا فیرعەون لەکاری ئەوان ئاگادار بکاتەوە. فیرعەون قەشمەرێکی بوو کە کاری ئەوە بوو فیرعەون بینێتە پێکەنین. ئەو فیرعەونی ئاگادار کردەوە و فیرعەون فەرمانیدا و مۆڵەتیان بەو دووانەدا. کاتێك هاتن ، موسا پێی وت: من نێردراوی خواوەندی جیهانیانم. فیرعەون ئەوی ناسیەوە و وتی: ئایا تۆمان وەك مناڵی خۆمان پەروەردە نەکرد؟ تۆ چەندین ساڵی درێژی تەمەنت لەنێوان ئێمەدا بەسەربرد. و تۆ ئەو کارەی لەگەڵ ئێمەدا کرد (پیاوێکت لەئێمە کوشت) و لەناسپاسانی. موسا وتی: ئەو کارەم کرد و ئەوسا لەگومڕاکان بووم و چوونکە لەئێوە دەترسام رامکرد و خوا زانستی فێرکردم و منی وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژارد (شعرا/٢١/٨/٣٦). فیرعەون وتی: ئەگەر نیشانەت هێناوە نیشانی بدە ئەگەر لەراست وتارانیت. موسا داردەستەکەی خۆی فڕێدا کە لەناکاو بەشێوەیەکی ئاشکرا بوو بەئەژدیها (اعراف/١٠٦/٧–١٠٧). ئەژدیها دەمی کردەوە و دیانەکانی خوارەوەی لەسەر

زەوی دانا و دیانەکانی سەرەوەی تا بەرزایی کۆشکەکە بردە سەر و ویستی فیرعەون بخوات. فیرعەون ترسا و لەشوێنەکەی هەستا و خۆی پیس کرد. ئەوسا بیست و چەند رۆژ لەو حاڵەدا مایەوە. گرفتاری ئازاری سك بوو. نەوەندەی نەمابوو لەناو بچێت. فیرعەون موسای بەخواوەندەکەی سوێنددا ئەژدیهاکە هەڵبگرێتەوە. موسا هەڵیگرت و بوو بەداردەست. ئەوسا دەستی بردە گیرفانی و دەریهێنا کەهاوشێوەی بەفر سپی بوو و رووناکی لێوە دەردەوشایەوە. دواتر خستیەوە گیرفان و دەریهێنایەوە. دووبارە دەست بەرەنگی یەکەمی خۆی دەرهاتەوە. دووبارە دەستی کردە گیرفان و دەریهێنا و روناکییەکەی تا ئاسمان دەدرەوشایەوە و چاوەکانی زەق دەکرد و روناکی بەدەوروبەری خۆی دەبەخشی و دەگەشت ماڵەکان و لەدەلاقە و کەلێنەکان و پشت پەردەکان دەبینرا. فیرعەون نەیتوانی لێی بروانێت. دواتر موسا دەستی بردە گیرفانی و دەریهێنایەوە کە هاوشێوەی رەنگی یەکەمی بوو.

خوا وەحی بۆ موسا و هارون ناردەخوار: بە نەرمی قسە لەگەڵ فیرعەون بکەن ئەگەری هەیە خوای بیربکەوێتەوە یا لێی بترسێت ( طه ٢٠/٤٤). موسا وتی: ئایا دەتەوێت لاویەتیت بۆ بگەرێنمەوە کە هیچ کات پیرنەبیت؟ و پاشایەتیت بەهێز بکەم کەلەتۆ نەسەندرێتەوە و بۆ تۆ خۆشی خەوتن لەگەڵ ژنان و خواردنەوە و سواربوون بگەرێنمەوە و کاتێك بمریت برۆیتە بەهەشت بەو مەرجەی باوەڕ بەمن بێنیت؟ فیرعەون وتی: ئەم کارە ناکەم تا وەزیرەکەم هامان بێت. کاتێك هامان ئامادە بوو فیرعەون وتەکانی موسای بۆ گێرایەوە. هامان بەسست و ناتەوانی ناوبرد و وتی: ئایا دوای ئەوەی دەتپەرەستن دەتەوێت کەسێکیتر بپەرەستیت؟ من لاویم بۆ تۆ گەڕاندەوە. ئەوسا وسمەی بۆ دروست کرد و قژی ئەوی پێ بۆیاخ کرد و ئەو یەکەم کەس بوو قژی خۆی بەرەنگی رەش رەنگ کرد. کاتێك موسا ئەوی بینی، ترسا. خوا وەحی پێکرد: نەکا ئەوەی دەیبینی بتترسێنێت چوونکە ماوەیەك زیاتر نامێننەوە. کاتێك فیرعەون بیستی، رۆشتە لای خەڵکەکەی و وتی: ئەم پیاوە موسا جادوگەرێکی گەورەیە. فیرعەون ویستی بیکوژێت بەڵام باوەرهێنەری بنەماڵەی فیرعەون کەناوی خەربیل (حەزقیل)بوو وتی: ئایا پیاوێك لەسزای ئەوەدا دەکوژن کەوتویەتی خوا

ئافرێنەری منە؟ ئەو نیشانەی راستی بۆ پێغەمبەرایەتی خۆی نیشانی ئێوەدا (غافر/٤٠/٢٨). گەورەکانی ولاّتی فیرعەون پێیان وت: ئەو و براکەی رابگرە و نێردراوانی خۆت بنێرە تا هەموو جادوگەرە زاناکان بۆ تۆ کۆبکەنەوە (شعرا/٢٦/٣٦–٣٧). فەرمانیدا و جادوگەرانی کۆکردەوە کەدەڵێن حەفتا کەس بوون. دەستەیەك دەڵێن حەفتا و دو کس و دەستەیەك دەڵێن سی هەزار و دەستەیەك پانزە هەزار. ئەوان یەکێك لەرۆژەکانی جەژنی فیرعەونیان بۆ کۆبوونەوە دیاری کرد. فیرعەون ئەوانی ریز کرد و خەڵکی کۆکردەوە. موسا لەگەڵ براکەی هارون هات و لەدەستی موسا داردەستەکەی بوو. روی کردە ئەو تاقمە و فیرعەون لەگەڵ سەرانی دەربار لەشوێنی تایبەت دانیشتبوون. کاتێك موسا نزیك جادوگەرەکان بوویەوە وتی: هاوار لەئێوە! درۆ بۆ خوا هەڵمەبەستن کەئێوە بەئەشکەنجە ماڵوێرانکەر دەکات و هەر کەس درۆ هەڵبەستێت، بێ هیوا دەبێت (طة/ ٢٠/٦١). جادوگەران بەیەکیان وت: ئەمە قسەی جادوگەرێك نییە. دواتر وتیان: لەبەرابەر تۆ جادووێك هاوشێوەی جادووەکەی خۆت دەهێنییەوە کەهەرگیز هاوتای ئەوەت نەبینیبێت. جادووگەران وتیان: سوێند بەپیرۆزی فیرعەون بێ گومان سەرکەوتن بەدەست دێنین (شعرا/٢٦/٤٤). ئەوسا جادوگەران بەموسایان وت: یا موسا تۆ سەرەتا فڕی دەدەیت یا ئێمە (اعراف/٧/١١٥). موسا وتی: ئێوە. ئەوان پەت و داردەستەکانی خۆیان فڕێدا کە لەناکاو لەبەرچاوی بینەران وەك مار کێوپەیکەرەکان دەرکەوتن و ئەو دەشتەیان پڕکرد ولەسەر پشتی یەك سوار بوون. موسا ترسی کەوتە دڵ، خوا وەحی پێکرد: ئەوەی لەدەستدایە فڕیبدە تا مارەکانی ئەوان بخوات، ئەوان فێڵێکی جادووگەرانەیان دورست کردووە و جادوگەر هەرچی بکات و روو لەهەر شوێنێك بکات رزگاری نابێت (طة /٢٠/٦٩). موسا داردەستەکەی فڕێدا، بوو بەئەژدیهایەك و روی کردە پەت و دارەکانی ئەوان کە لەبەرچاوی خەڵك هاوشێوەی ماربوون. داردەستی ئەژدیهاکەی موسا دەستی بەقوت دان ولەناوبردنی ئەوان کرد بەشێوەیەك هیچی لەسەر زەوی نەهێشتەوە. ئەوسا موسا دەستی برد و ئەو ئەژدیهایە بوو بەداردەست. گەورەی جادوگەرەکان کوێر بوو. پێیان وت: داردەستەکەی موسا بۆتە ئەژدیها و پەت و دارەکانی ئێمە سات بەسات دەخوات. وتی: هیچ نیشانێك لەو دەرنەکەوت؟

نەگەرایەوە بۆ شێوەیە یەکەمی خۆی؟ وتیان: نە. وتی: ئەمە جادوو نییە. کەوتە سەر زەوی و نوێژی بۆ خوای موسا برد و هەموو جادوگەرەکان ئەوکاریان کرد. وتیان: ئێمە باوەڕمان هێنا بەخواوەندی جیهانیان، خوای موسا و هارون (شعرا/٢٦/٤٧–٤٨). فیرعەون وتی: باوەڕتان هێنا بەو پێش ئەوەی هیچ دەستورێکتان پێبدەم. ئەو گەورە و مامۆستای ئێوەیە کەئێوەی فێری جادووگەری کردووە. بێ هیچ گومانێك دەست و پێی ئێوە لەراست و چەپ و لەچەپ و راست دەبڕم و لەسەر لقی دارخورما هەڵتاندەواسم و بێ گومان بەباشی دەزانن ئەوە کام کەس لەئێمەیە ئەشکەنجەیەکی بەئازارتر و هەمیشەییتری هەیە (طه/٢٠/٧١). فیرعەون ئەوانی کوشتار و لەت لەت کرد و ئەوان وتیان: خوایە، خۆراگریمان پێببەخشە و ئێمە وەك خواپەرستەکان بمرێنە (اعراف/٧،١٢٦). ئەوان لەسەرەتای ئەو رۆژە لەناسپاسەکان بوون و لەکۆتاییەدا گیانبازەکان.

خەربیل باوەڕداری بنەماڵەی فیرعەون، باوەری خۆی دەشاردەوە. دەڵێن: ئەو یەکێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل بوو. دەستەیەك دەڵێن: لەقیبتیەکان بوو. دەستەیەکیتر دەڵێن: ئەو دارتاشە بوو سنوقەکەی دروست کرد و دایکی موسا، موسای کردە ناوی و خستیە ناو نیل. کاتێك سەرکەوتنی موسای بەسەر جادوگەرەکاندا بینی، باوەڕی خۆی ئاشکرا کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو پێشتر باوەری خۆی ئاشکرا کرد ولەگەڵ جادوگەرەکان لەدار درا. ئەو ژنێکی باوەڕداری بوو کەئەویش باوەری خۆی دەشاردەوە. ئەو ئارایشگەری کچی فیرعەون بوو. رۆژێك قژی کچی فیرعەونی دادەهێنا و شانە لەدەستی کەوت و وتی: بەناوی خوا هەڵیدەگرمەوە. کچی فیرعەون وتی: بە ناوی باوکی من؟ ژنی ئارایشگەر وتی: نا بەناوی خوی من و تۆ و باوکت. کچی فیرعەون باوکی لەو گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە. فیرعەون ئەم ژنەی لەگەڵ مناڵەکانی بانگ کرد و وتی: خوای تۆ کێیە؟ ژنی ئارایشگەر وتی: خوای من و تۆ خواوەندە. فیرعەون فەرمانیدا و تەنورێکی مسینیان هێنا، فەرمانیدا گەرمی بکەن و ئەو ژنەو و مناڵەکانی ئەشکەنجە بکەن. ژن وتی: داوایەکم لەتۆ هەیە. فیرعەون وتی: چییە. ئێسقانەکانی من و مناڵەکانم کۆبکەیتەوە و بەخاکمان بسپێرێت. فیرعەون

وتی: ئەو کارە دەکەم. فیرعەون فەرمانیدا یەك یەك منداڵەکانیان خستە ناو ئاگرەوە. دواییی ئەوان منداڵێکی کەم تەمەن بوو کە بەدایکی وت: خۆڕاگربە دایکە چوونە راستی لەگەڵ تۆدایە. ئەو ژن و منداڵەیان پێکەوە خستە ناو تەنووری ئاگرین.

ئاسیە ژنی فیرعەون لەمنداڵەکانی ئیسرائیل بوو و دەستەیەك دەڵێن: لەخەڵکانیتر بوو. ژنێکی باوەڕداربوو و باوەڕی خۆی دەشاردەوە. کاتێك ژنی ئارایشگەر کوژرا، ئاسیە فریشتەکانی بینی گیانی بۆ ئاسمان دەبەن. خوا زانایی پێبەخشی. ئەو لەو ژنە ئارایشگەرەی دەڕوانی کە دوژمنان وەحشیانە ئەشکەنجەیان دەدا. کاتێك فریشتەکانی بینی بەهێز بوو و دڵنیایی زیادی کرد و زیاتر لەجاران موسای بەراستگۆ دانا. بەم شێوە بوو لەناکاو فیرعەون هات و بەسەرهاتی ژنی ئارایشگەری پێدا. ئاسیە پێی وت: هاوار لەتۆ! چەندە هەڵەشەیت لەبەرابەر خوا! فیرعەون وتی: ئەگەری هەیە گیرۆدەی هەمان شێتی بووبێتیت کەژنی ئارایشگەر گیرۆدەی بوو. ئاسیە وتی: شێت نەبووم بەڵکو باوەڕم بەخوای گەورە هێناوە کەخواوەندی جیهانیانە.

فیرعەون دایکی ژنەکەی بانگ کرد وپێی وت: کچەکەت گیرۆدەی ئەو شتە بووە کەژنی ئارایشگەر توشی ببوو. سوێند دەخۆم یا ئەشکەنجەی مەرگ دەچێژێت یا بەخوای موسا کافر دەبێت. دایك لەگەڵ کچەکەی بەتەنیای دانیشت و داوای لیکرد ببێتە هاودەمی فیرعەون. ئاسیە حاشای کرد و وتی: ئەوەی کە بەخوا کافر ببم، سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم. فیرعەون فەرمانیدا لەبەرابەر ئەو چوار بزمار داکوتن. ژنەکەی چوارمێخە کێشا و ئەشکەنجەی کرد تا گیانیدا. کاتێك ئاسیە نیشانەکانی مەرگی بینی، وتی: خوایە، بۆ من لای خۆت خانوێك دروست بکە و لەفیرعەون و هەڵس و کەوتەکانی رزگار بکە و لەدەستەی ستەمکاران جیامکەرەوە (تحریم/٦٦/١١). خوا زانایی ئەوی زیاد کرد و ئەو فریشتەکان و بەخشینە فراوانەکان کە بۆی ئامادە کرابوون بەچاو بینی و پێکەنی. فیرعەون وتی: بروانن چۆن شێت بووە! لەژێر ئەشکەنجە پێدەکەنێت. ژنەکە مرد.

کاتێك فیرعەون بینی خەڵکەکەی ترسی موسایان کەوتۆتە دڵەوە، ترسا باوەڕی پێ بێنن و پەرستنی ئەو پشت گوێ بخەن. فێڵێکی بۆخۆی دروست کرد و بەوەزیرەکەی وت: ئەی هامان، کۆشکێك بۆ من دروست بکە ئەگەری هەیە بەدەرگاکان بگەم. دەرگاکانی ئاسمان تا ئەوەی چاوم بەخوای موسا دەکەوێت هەرچەندە بەدرۆزنی دەزانم. بەم شێوەیە کاری ڤێزەونی فیرعەون بۆئەو نێردرا و لەرێگای ڕاست هەڵگەڕایەوە و فێڵەکەی فیرعەون جگە لەگومڕایی نییە (غافر/٤٠/٣٧). فەرمانی دروست کردنی خشتی بە هاماندا و یەکەم کەس بوو دروستی کرد. دروستکەرانی کۆکردەوە و کۆشکەکەی لەماوەی حەوت ساڵدا دروست کرد و بیناکەی بەرادەیەك بەرز کردەوە کە تا ئەو سات هیچ بینایەك بەو بەرزییە دروست نەکرابوو. موسا ئەم کارەی بەگەورە و دژوار بینی. خوا وەحی پێکرد: ئەو لەکارەکەی خۆی بەجێبێڵە من بەداوەکەی خۆی دەیکوژم و ئەوەی دورستی کردووە لە یەك ساتدا وێرانی دەکەم. کاتێك کاری دروست کردن کۆتایی هات، خوا فەرمانی بەجبرەئیلدا و وێرانی کرد و هەموو دروست کەرانی لەوەستا و کرێکارەوە لەناو برد. کاتێك فیرعەون ئەم کارەی لەکارەکانی خوا بینی، فەرمانی بەهاوڕێیانی خۆیدا باروودۆخ لەسەر موسا و منداڵەکانی ئیسرائیل دژوار بکەن. ئەم کارەیان کرد. منداڵەکانی ئیسرائیلیان بۆ ئەو کارانە ناچار دەکرد کەتوانای ئەنجامدانیان نەبوو. ژنان و پیاوان لە دژواریدا بوون. پێش لەوە، کاتێك کاریان بەمنداڵەکانی ئیسرائیل دەکرد خواردنیان پێدەدان بەڵام ئێستا بەبرسیەتی دەیانهێشتنەوە. ئەوان ڕۆژگاری خۆیان بەدژواری تێپەر دەکرد و دەیانویست کارێك بکەن نانی لێبخۆن. شکایەتیان بردە لای موسا و موسا وتی: داوای هاوکاری لەخوا بکەن و بەخۆڕاگری ژیان بەسەر ببەن کەسەرکەوتن بۆ خۆپارێزانە. هیوادارم خوا دوژمنەکانی ئێوە لەناو ببات و ئێوە لەسەر زەوی بکاتە فەرمانڕەوا تا ببینێت چۆن هەڵس و کەوت دەکەن (اعراف/٧/١٢٩).

لەبەر ئەوەی فیرعەون و هاوەڵانی جگە لەپێداگرتن لەسەر ئاسپاسی کارێکیتریان نەکرد، خوا نیشانەکانی خۆی یەك لەدوای یەك بۆ دەناردن. سەرەتا تۆفانی بۆ ناردن کەهەمان بارانی بەردەوامە. ئاو هەموو شتێکی لەخۆیدا نوقم کرد. فیرعەونییەکان

بەموسایان وت: بەخواکەی خۆت بڵێ ئەم زیانە لەئێمە دوور بخاتەوە تا باوەڕت پێ بێنین و منداڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ تۆدا دەنێرین. خوا ئەو زیانەی لەسەر هەڵگرتن و کشتوکاڵیان روی لەگەشە کردن بوو. ئەوان وتیان: شادمانین لەوەی بارانمان نییە. لەم کاتەدا خوا کولەی بۆ ناردن کەهەموو بەرهەمەکانی ئەوانی خوارد. داوایان لەموسا کرد ئەو زیانەیان لەسەر هەڵگرێت و ئەمانیش باوەڕی پێدێنن. موسا داوای لەخوا کرد و خوا ئەو زیانەیشی هەڵگرت. باوەڕیان نەهێنا و وتیان: کەمێك لەبەرهەمی کشتوکاڵی ماوەتەوە (و ئەمە بۆ ئێمە بەسە). خوا ئەسپێی بۆ ناردن کە هەموو بەرهەم و ڕووەکەکانی ئەوانی لەناو برد و خواردەمەنییەکانی ڕزاند و نەیانتوانی خۆیان لەو زیانە بە دوور بگرن. دوبارە داویان لەموسا کرد خوا ئەو زیانەیان لەسەر هەڵبگرێت تا باوەڕ بێنن و ئەویش ئەم کارەی کرد بەڵام ئەوان وتەکانی خۆیان نەبردەسەر. لەمکاتەدا خوا قرپۆکی بۆ ناردن. قرپۆکەکان دەکەوتنە ناو قازانەکانیان و دەرۆشتە ناو خواردنەکانیان. هەموو شوێنێکیان پڕ کردبوو. داوایان لەموسا کرد ئەو زیانەیش هەڵگرێت تا باوەڕ بێنن. ئەم کارەی کرد بەڵام ئەوان باوەڕیان نەهێنا. دواتر خوا خوێنی بۆ ناردن و هەموو ئاوی فیرعەونییەکان بوو بەخوێن. فیرعەون و ئیسرائیلیەکان لەیەك کانی ئاویان هەڵدەگرت. ئیسرائیلی بە دەمی خۆی ئاوی هەڵدەگرد و دەیرژاندە دەمی فیرعون بەڵام ئاوەکە دەبوو بەخوێن. ئەم کارە حەوت رۆژ درێژەی کێشا. داویان لەموسا کرد ئەو زیانەیشیان لەسەر هەڵبگرێت تا باوەڕ بێنن. ئەم کارەی کرد بەڵام باوەڕیان نەهێنا.

کاتێك لەباوەرهێنانی ئەوان و فیرعەون بێ هیوا بوو، موسا پارایەوە و هارون ئامینی وت. موسا وتی: خواوەندا، تۆ لەژیانی ئەم دنیا بەفیرعەون و خەڵکەکانی سامان و زێڕت بەخشیوە. خواوەندا بۆ ئەوەی خەڵك لەتۆ دوور بکەنەوە. خواوەندا سامانی ئەوان لەناوبەرە و دڵەکانیان رەق و کوێر بکە تا باوەڕ نەهێنن مەگەر ئەوەی ئەشکەنجەیەکی دژوار بەرونی ببینن (یونس/١٠/٨٨). خوا داواکارییەکەی ئەوانی وەڵام دایەوە و سامانی فیرعەونییەکانی لەناو برد جگە لەئەسپەکان و زێڕ و زیوەکانی ئەوان. خوا سامانی ئەوانی کردە بەرد و هەروەها خورما وخواردن و ئارد و

شتەکانی هاوشێوەی. ئەمە یەکێك لەو نیشانانەبوو کە موسا لەلایەن خواوە هێنای.

کاتێك کار لەسەر موسا درێژەی کێشا، خوا وەحی بەموسا کرد منداڵەکانی ئیسرائیل لەمیسر بباتە دەر و تابوتی یوسف کوڕی یەعقوب لەگەڵ خۆیدا ببات و لەسەرزەوینی پیرۆز بەخاکی بسپێرێت. موسا بەدوای تابووتدا گەڕا بەڵام کەس نەیناسیەوە جگە لەپیرێژنێکی بەتەمەن کەشوێنەکەی لەنیل نیشاندا. موسا دەریهێنا و پەیکەرەکە لەناو سنوقێکی مەرمەڕیدا بوو. ئەوەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و بەرێکەوت. فەرمانی بەئیسرائیلیەکاندا هەرچەندە دەتوانن، ئەندازەیەکی زیاتر لەزێر و زیوی قیبتیەکان بەئەمانەت وەربگرن. ئەوان ئەم کارەیان کرد. شتی فراوانی زۆریان لەگەڵ خۆیاندا برد. موسا منداڵەکانی ئیسرائیلی شەوانە لەمیسر بردە دەر و قیبتیەکان ئاگادار نەبوون. موسا لەکۆتایی سوپاکەی منداڵەکانی ئیسرائیلدا بوو و هارون فەرماندەیی پێشرەوەکانی گرتەدەست. کاتێك لەمیسر هاتنە دەر ژمارەیان بەشەشسەد و بیست هەزار کەس دەگەشت. فیرعەون شوێن ئیسرائیلییەکان کەوت و فەرماندەیی پێشرەوەی سوپاکەی لەدەست هاماندا بوو. کاتێك ئەم دوو دەستە چاویان بەیەك کەوت، هاوەڵانی موسا وتیان: ئێستا دووبارە دەبینەوە بە دیل (شعرا/٢٦/٦١).

ئەی موسا پێش هاتنی تۆ ئێمەیان ئازار دەدا و دوای هاتنی تۆیش (اعراف/٧/١٢٩). پێش هاتنی تۆ پیاوانیان دەکوشت و ژنانیان بەزیندویی دەهێشتەوە. ئێستا دوای هاتنی تۆ وای فیرعەون وسوپاکەی دێن و دەمانگرن و دەمانکوژن. موسا وتی: هەرگیز بەم شێوە نییە. خوا لەگەڵ مندایە و بەم زووانە ڕێنوێیم دەکات (اعراف/٧/٦٢).

ئیسرائیلیەکان دەریایان لەبەرابەر خۆیاندا بینی و فیرعەون بەدوایانەوە بوو. ئەوان لە لەناوچوونی خۆیان دڵنیا بوون. موسا هەنگاوی بردە پێش و بەداردەستەکەی لەدەریایی دا، قەڵشتی برد و هەر بەشێکی بوو بەهاوشێوەی کێوێکی گەورە (شعرا/٢٦/٦٣). تیایدا دوانزە ڕێگا بۆ تێپەڕینی دوانزە تیرەی منداڵەکانی ئیسرائیل دروست بوو. هەرکام لەهۆزەکان دەیانوت هاورێکانی ئێمە لەناوچوون. خوا فەرمانیدا دیوارە ئاوییەکان (لەناو دەریا) بوونە پەنجێرە یا تۆر بەشێوەیەك هەر تیرەیك

هاوڕێکانی خۆی لەچەپ و ڕاست دەبینی. فیرعەون و هاوڕێکانی لەدەریا نزیك بوونەوە و دەریا و ڕێگە ئاوییەکانیان بینی. ئەو بەهاوەڵانی خۆی وت: نابینن دەریا بۆ من قەڵشتی بردووە وبلاو بۆتەوە تا دوژمنەکانی خۆم بدۆزمەوە؟ کاتێك فیرعەون گەشتە دەروازەکانی ئاو، ئەسپەکان لەڕۆشتن وەستان. جبرەئیل سوار لەسەر ماهینێك کە بەدوواى جوتەکەیدا دەگەرا، دابەزی و ئەسپەکان بۆنیان کردو بەدوایدا بۆناو دەریا غاریاندا. تا دواین کەس لەلەشکری فیرعەون گەشتە ناو دەریا و کاتێك یەکەم کەس ویستی لەوبەر بێتەدەر، لەناکاو دیوارە ئاوییەکان دارمان و دەریا سوپاییەکانی فیرعەونی قووتدا. شەپۆلەکان هاتنە یەك و فیرعەون و سوپاکەیان لەناو ئاودا خنکاند. منداڵەکانی ئیسرائیل ئەوانیان دەبینی. جبرەئیل بەتەنیایی سەرقاڵی فیرعەون بوو و مشتێك لەقوراوی دەریای هەلگرت و خستیە ناودەمیەوە. کاتێك دەیویست لەناو ئاودا بخنکێت، وتی: باوەڕم هەیە خوایەك جگە لەو خوایەی منداڵەکانی ئیسرائیل شوێنی کەوتون، نییە. خوا میکائیلی نارد تا سەرکۆنەی بکات و بڵێت: ئێستاکە؟ تۆ پێش ئەمە گوناحت دەکرد و لەخراپەکاران بوویت (یونس/١٠/٩١).

جبرائیل – درەنگتر – بەپێغەمبەری ئیسلامی وت: خۆزگە دەتبینی چۆن مشتێك قوڕای دەریام کردە دەمی فیرعەون لەبەر ئەوەی نەکا قسەیەکی نەرم بکات و خوا بیبەخشێت.

کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل ڕزگاریان بوو، وتیان: فیرعەون لەناو ئاودا نەخنکاوە. موسا لەخوا پاڕایەوە و خوا لاشەی فیرعەونی لە ژێر ئاو هێنایە سەرئاو و منداڵەکانی ئیسرائیل گرتیان و تیکە تیکەیان کرد. ئەوسا ئیسرائیلیەکان بەڕێکەوتن. لای خەڵکانێکەوە تێپەڕین بتیان دروست دەکرد و دەیانپەرەست. منداڵەکانی ئیسرائیل بەموسایان وت: ئەی موسا بۆ ئێمەیش خوایەك دروست بکە وەك چۆن ئەمانە خوایان هەیە. موسا وتی: ئێوە خەڵکانێکی بەراستی نەزانن (اعراف/٧/١٣٨). منداڵەکانی ئیسرائیل چاویان لەو کارە پۆشی. ئەوسا موسا دو لەشکری بۆ شارەکانی فیرعەون نارد  کە هەرکام لەدوانزە هەزار پیاوی شەرکەر پێکهاتبوو، شارەکان گەورە

و سەرۆکیان لەدەستدا بوو. جگە لەژن و مناڵ و پیر وپەك کەوتە کەسیان لێنەمابوویەوە. سوپاکەی موسا ڕۆشتنە ناوشارەکان و سامانی فیرعەونییەکانیان تالاّن کرد. ئەوەی دەیانتوانی هەڵیانگرت و پاشماوەکەیان فرۆشت و گەڕانەوە و پەیوەستی موسا بوون. فەرماندەکانی ئەم دوسوپایە یوشەع کوڕی نون و کالب کوڕی یوفەننا بوون.

خوا ئەو کاتەی موسا لەمیسربوو، مژدەی پێدا بوو کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل لەمیسر هاتنە دەر و ئەو دوژمنەکانی ئەوانی لەناوبرد، بۆ منداڵەکانی ئیسرائیل کتێبێك دەنێرێت کەتیایدا کارە شیاو و نەشیاوەکان نیشان دراوە. کاتێك خوا فیرعەونی لەناوبرد و منداڵەکانی ئیسرائیلی ڕزگار کرد، بەموسایان وت: ئەی موسا، ئەو کتێبەی مژدەیت بەئێمەدا بوو بیهێنە. موسا دوای لەخوا کرد و خوا فەرمانی پێدا سی ڕۆژ بەڕۆژو بێت و جلی پاك و خاوێن لەبەر بکات و بێتە کێوی توری سینا تا قسەی لەگەڵ بکات و کتێبەکەی پێبدات. موسا سی ڕۆژ بەڕۆژو بوو. ڕۆژی یەکەمی زیقەعدە دەستپێکرد. کاتێك ویستی بەرەو کێوەکە بڕوات، بۆنی دەمی خۆی بەناخۆش زانی و بەداری خەرنوب شۆردی. دەستەیەك دەڵێن بەپێستی دارێك ددانەکانی شۆرد. لەم کاتەدا خوا وەحی پێکرد: ئایا نازانیت من بۆگەنی دەمی بەڕۆژوان لە بۆنی عەتر پێخۆشترە؟ خوا فەرمانی پێدا دە ڕۆژیتر بەڕۆژو بێت. ئەو دە ڕۆژ تا دەی زیحەجە بەڕۆژو بوو و کاتی دیاری کراوی خوایی تا چل ڕۆژ بەسەرچوو(اعراف/٧/١٤٢).

لەم دە شەوەی کۆتایی، منداڵەکانی ئیسرائیل فریویان خوارد چوونکە سی ڕۆژ کۆتایی هات و موسا نەگەڕایەوە. پیاوێك بوو بەناوی سامری کەخەڵکی باجەرمی لەمنداڵەکانی ئیسرائیل بوو. هارون بەئیسرائیلیەکانی وت: ئەی منداڵەکانی ئیسرائیل، ئەو زێر و زیوەی لەقیبتیەکانتان وەرگرتووە و ئەو تالاّنییەی لەمیسریەکان دەستانکەوتووە، بۆ ئێوە حەلاڵ نییە. چاڵێك هەڵکەنن و بیکەنە ناوی تا موسا دەگەڕێتەوە و باوەڕی خۆی لەمبارەوە بڵێت. ئەم کارەیان کرد. سامری هات و مشتێ خۆڵی کە لەژێر سمی ئەسپەکەی جبرەئیل هەڵیگرتبوو، پرژاندە سەر ئەو چاڵە و ئەو زێر و زیوە بوو بەگوێرەکەیەك بەجەستە و دەنگی گوێرەکە (اعراف/٧/١٤٨ ، طه

/٢٠/٨٨). دەستەیەك دەڵێن: زێر و زیو خرایە ناگرەوە و دواتر سامری ئەو خۆڵەی پرژاند و زێر و زیو بو بەگوێرەکەیەك بەجەستە و دەنگی گوێرەکە. دەستەیەکیتر دەڵێن: تەنیا یەك جار بانگی بەرز کردەوە و ئیتر ئەو کارەی دووبارە نەکردەوە. دەستەیەکیتر دەڵێن: سامری لەماوەی سێ رۆژدا لەو زێر و زیوە گوێرەکەیەکی دروست کرد و دواتر ئەو خۆڵەی پیاهەڵپرژاند و هەستا و بانگی بەرز بوویەوە.

کاتێك بەم شێوەیان بینی، سامری بەوانی وت: ئەمە خوای ئێوەیە و خوای موسایە. ئەو لەبیری کرد(طه/ ٢٠/٩٠). موسا خواکەی خۆی لێرەدا لەبیرکرد و بۆ شوێنێکیتر رۆشت و بۆی گەرا. ئەوان رویان تێکرد و لەدەوری کۆبوونەوە و ئەویان پەرەستی. هارون وتی: خەڵکینە ئێوەیان بەم گوێرەکە هەڵخەڵەتاندووە. خوای ئێوە خواوەندی میهرەبانە. شوێنکەوتەی من بن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی من بن (طه/ ٢٠/٩٠). دەستەیەك فەرمانیان لێبرد و دەستەیەك نافەرمانییان کرد. هارون لەناو ئەو کەسانەی فەرمانیان لێبرد مایەوە و شەڕی لەگەڵ ئەو دەستەیتردا نەکرد. کاتێك خوای گەورە لەگەڵ موسادا قسەی کرد، فەرمووی: چ شتێك وای لێکردی بەپەلە بێیت بۆئێرە و خەڵکەکەی خۆت بەجێبێڵی؟ موسا وتی: خوای من، ئێستا ئەوان بەدوای مندا دەگەرێن و من بۆ لای تۆ هاتم تا پەسەندم بکەیت و لێم رازی بیت. فەرمووی: ئەی موسا کەواتە بزانە دوای تۆ خەڵکەکەتمان خستە ناو تاقی کردنەوە و سامری ئەوانی گومڕا کرد(طه/٢٠/٨٣–٨٥). موسا وتی: خوایە سامری وتی گوێرەکە بپەرەستن بەڵام کێ رۆحی کرد بە بەریا؟ فەرمووی: من. موسا وتی: کەواتە تۆ ئەوانت گومڕا کرد.

کاتێك خوا لەگەڵ موسادا قسەی کرد، موسا ویستی بیبینێت. لەبەر ئەمە وتی ، خوایە خۆت نیشان من بدە تا بتبینم. فەرمووی: هیچکات من نابینیت بەڵام لەو کێوە بروانە، ئەگەر لەشوێنەکەی خۆی نارام مایەوە من دەبینیت. کاتێك خوا نوری رژاندە سەر کێوەکە، ورد و تیکە تیکەی کرد و موسا کەوت و بێهۆش بوو. کاتێك هاتە هۆش، وتی: خوایە، پاکی و راستیت، بۆ لای تۆ گەرامەوە و لەیەکەم شوێنکەوتووانم (اعراف/٧/١٤٣). خوا چەندین تەختەداری بەموسا دا کە تیایدا کارە شیاو و ناشیاوەکان و ئامۆژگارییەکان نوسرا بوو. موسا گەرایەوە و بەرادەیەك

روخساری گەشاوە و نورانی بوو هیچ کەس نەیدەتوانی لێی بروانێت. ئەو بۆ ماوەی چل رۆژ پارچەیەکی هەوریشمی لەروخساری خۆی دەبەست. ئەمە روناکییەکی فراوانی خوایی بوو روخساری ئەوی گرتبوویەوە. کاتێك گەرایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی و ئەوانی بەگوێرەکە پەرەست بینی، تەختە دارەکانی لەدەست کەوتە خوار و سەر و ریشی براکەی گرت و بەرەولای خۆی رایکێشا. هاررون وتی: ئەی کوری دایکی من، ریش من و سەری من مەگرە. ترسام بڵێیت جیابوونەوە و دوو بەرەکیت خستە ناو منالەکانی ئیسرائیل و ریزت لەقسەکەی من نەگرت (طة/٢٠/٩٤). ئەو هارونی بەرەلا کرد و روی کردە سامەری و وتی: ئەمە چ کارێکە تۆ کردت ئەی سامەری؟ وتی: ئەوەم بینی و وامزانی ئێوە نەتانبینوە و نەتانزانیوە. مشتێك خۆڵم ل شوێن پێی نێردراوی خوایی(جبرەئیل) هەڵگرت و پرژاندم بەسەر زێر و زیوەکان و ئەمە ئەو شتە بوو جەستەی من بۆ منی دروست کرد. موسا وتی: لەبەر چاوم ونبە. سزای تۆ لە ژیانی ئەم دنیا ئەوەیە هەر کەس لەتۆ نزیك بکەوێتەوە پێی بڵێی (دوور کەوەرەوە). لەم خوایەی خۆت بروانە کە بەردەوام بەدەوریدا دەسورێیتەوە. بێ هیچ گومانێك دەیسوتێنین و دیخەینە دەریا و پرژوبلاوی دەکەینەوە (طة /٢٠/٩٥/٩٧). ئەوسا موسا گوێرەکەکەی هەڵگرت و بە سماتە سووی، کردی بەئارد و سوتاندی و فەرمانی بەسامەری دا میزی پیاکرد دواتر فرێدایەی ناو دەریا.

کاتێك موسا تەختە دارەکانی نیشاندا، شەش لەسەر حەوتی رۆشت و یەك لەسەر حەوتی مایەوە. منالەکانی ئیسرائیل خوازیاری گەرانەوە بۆ لای خوا بوون بەلام خوا بەتۆبەکەیان رازی نەبوو. موسا پێی وتن: خەڵکینە ئێوە بەپەرەستنی گوێرەکە ستەمتان لەخۆتان کرد. بۆ رێگای خوا بگەرێنەوە و یەکتر بکوژن (بقرە/٢/٥٤). ئیسرائیلیەکان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد و ئەوانەی گوێرەکەیان پەرەستیبوو لەگەڵ ئەوانەی نەیانپەرەستیبوو، دەستیان بەکوشتنی یەکتر کرد. هەر کام لەهەر دودەستە کەخوێنی رژا و کەوتە سەر زەوی (گیانبازی رێگەی خوا) هەژمار کرا. لەم ناوەدا حەفتا هەزار کەس کوژران. موسا و هارون هەستان و داوایان لەخوا کرد. خوا ئەوانی بەخشی و فەرمانیدا دەست لەکوشتنی یەکتر هەڵبگرن. دواتر ئەوانی بەخشی. موسا ویستی سامەری بکوژێت بەلام خوا فەرمانی پێدا لەحاڵی خۆیدا بەجێبێڵێت

چوونکە (خوا وتی) ئەو پیاوێکی بەخشەندەیە. موسا وازی لێهێنا و نفرینی کرد.
دواتر موسا حەفتا پیاوی چاکەکاری لەناو خەڵکەکەی خۆی هەڵبژارد و پێی وتن: لەگەڵ مندا بۆ لای خوا بگەرێنەوە و لەوەی کردووتانە داوای لێخۆشبوون بکەن، رۆژو بگرن و خۆتان پاك بکەنەوە. ئەوانی بۆ توری سینا برد یانی ئەو شوێنەی خواوەند قسەی لەگەڵ کرد. وتیان: داوا لەخوا بکە ئێمە قسەکانی ببیستین. وتی: ئەو کارە دەکەم. کاتێك موسا لەکێوەکە نزیك کەوتەوە هەورێکی چڕ بەسەریدا دابەزی و سەرانسەری کێوەکەی گرتەوە. موسا ڕۆشتە ناو هەورەکە و بەوانی وت: وەرنە پێش. ئەوان رۆشتنە پێش تا گەشتنە ناو هەورە چڕەکە. کەوتنە سەر زەوی و نوێژیان بۆ خوا برد. ئەوان قسەی خوایان بیست کە لەگەڵ موسادا گفتوگۆی دەکرد و پێی دەفەرموو ئەم کارە بکە و ئەو کارە مەکە. کاتێك کۆتایی پێهات، هەورەکە لەدەوروبەری موسا دوور کەوتەوە و موسا روی کردە ئەوان. وتیان: هەرگیز باوەڕ بەتۆ ناکەین مەگەر ئەوەی خوا بەئاشکرا ببینین (بقرە/٢/٥٥). لەناکاو هەورە بروسکە لێیدان و هەموویان مردن. موسا هەستا و بەگفتوگۆ و پاڕانەوە لەخواوەند سەرقاڵ بوو، وتی: خوایە تۆ چاکەکانی مناڵەکانی ئیسرائیلت هەڵبژارد. ئێستا ئەگەر بگەرێمەوە و ئەوان لەگەڵمدا نەبن، قسەکەی من بەراست نازانن. بەردەوام لەخوا پاڕایەوە تا گیانی بۆ ئەوان گەڕاندەوە و ئەوان یەك یەك زیندو بوونەوە و سەیری یەکرتیان دەکرد کەچۆن زیندوو دەبوونەوە. وتیان: تۆ داوا لەخوا دەکەیت و هەرچی داوای لێدەکەیت بەتۆی دەبەخشێت، داوای لێبکە ئێمەیش بخاتە ریزی پێغەمبەرەکان. موسا داوای لەخوا کرد و خوا ئەوانی کردە پێغەمبەر.
دەڵێن بەسەرهاتی ئەم حەفتا پیاوە پێش ئەوە بووە خوا لەمنالەکانی ئیسرائیل خۆش ببێت. کاتێك گەشتنە شوێنی دیاریکراو و داوای لێخۆشبوونیان کرد، خوا لێیان خۆش بوو و فەرمانیدا یەکتر بکوژن. و خوا زاناترە.
کاتێك موسا بەتەوراتەوە گەرایەوە بۆ لای منالەکانی ئیسرائیل، لەرازی بوون و ئەنجامدانی فەرمانەکانی خۆیان دوور خستەوە چوونکە بەسەخت و دژواریان دەزانی. خوا فەرمانی بەجبرەئیلدا. جبرەئیل کێوێکی لەفەلەستین بەئەندازەی سوپاکەی ئەوان، یەك فەرسەنگ لەیەك فەرسەنگ هەڵگرت و بەئەندازەی بەرزایی

پیاوێك، وەك سێبەر، بردیە سەر سەری ئەوان و ئاگرێكی لەبەرامبەرەوە بۆ ناردن و دەریایەك لەپشتەوە. موسا وتی: ئەوەی بۆ ئێوەی دەهێنین بیپارێزن و ببیستن. ئەگەر پێی رازی بوون و فەرمانەكانیتان ئەنجامدا چ باشتر و گەرنە بەم كێوە دەكوترێن و بەم ئاگرە دەسوتێنرێن و لەم ئاوەدا دەخنكێن. لەبەر ئەوەی بینیان شوێنی دەرباز بوونیان نییە پێی رازی بوون و لەسەر یەك لای روخساری خۆیان سوجدەیان برد و لەكاتی سوجدەبردن لەكێوەكەیان دەروانی. ئەم كارە لەناو جولەكەكان بوو بە سونەت كە لەسەر نیوەی روخساری خۆیان سوجدە ببەن. ئەوان وتیان: بیستمان و فەرمانبەردارین.

كاتێك موسا لەشوێنی گفتوگۆ كردن لەگەڵ خوا گەرایەوە، چل رۆژی تەواو، هەر كەس ئەوی دەبینی دەمرد و دەڵێن كوێر دەبوو. لەبەر ئەمە سەر و روخساری خۆی بەكلاو داپۆشی.

ئەوسا پیاوێك لەمناڵەكانی ئیسرائیل كورە مامەكەی خۆی كوشت و جگە لەو میرات هەلگری نەبوو. ئەم كارەی كرد تا سامانەكەی بەمیرات ببات. هەڵیگرت و لەشوێنێكدا دایشارد. ئەوسا هاتە لای موسا و داوای خوێنی ئەوی لەدەستەیەك لەمناڵەكانی ئیسرائیلیەكان دەكرد. ئەوان حاشایان لێكرد. موسا داوای لەخوا كرد و خوا فەرمووی مانگایەك بكوژن. ئەوان وتیان: ئایا گاڵتەمان پێدەكەیت؟ موسا وتی: پەنا دەبەمە بەر خوا ئەگەر لەنەزانەكان بم (بقرە/٢/٦٧). یانی ئەوانەی گاڵتە بەخەڵك دەكەن نەزانن. مناڵەكانی ئیسرائیل وتیان: ئەمە چ جۆر مانگایەك بێت؟ ئەگەر هەر مانگایەكی سادەیان دەكوشت بۆ ئەوان بەس بوو بەلاّم ئەوان بابەتەكەیان گەورە كردەوە و خواوەندیش بارودۆخی لێ دژوار كردن. سەختگیری ئەوان لەبەر ئەو هۆكارە بوو پیاوێك لەوان لەگەڵ دایكی خۆیدا زۆر بەباشی هەڵس و كەوتی دەكرد. ئەو، مانگایەكی بوو، لەگەڵ ئەو وەسفانەی بۆ مانگا داوا كراوەكە كرابوو، یەكی دەگرتەوە. چاكەكاری ئەو لەگەڵ دایكی سوودی پێبەخشی چوونكە جگە لەمانگاكەی ئەو هیچ مانگایەكیتر ئەو وەسفانەی نەبوو. مانگاكەی پێفرۆشتن بەو مەرجەی پێستەكەی لێوانلێو بكەن لە زێر و پێی بدەن. كاتێك مناڵەكانی ئیسرائیل لەبارەی مانگاكە پرسیاریان كرد، وتی: ئەورد و ئەبێ هێز (بقرە/٢/٦٨). دەڵێت ئەوردە و

نەتەمەنی زۆر بەڵكو نێوەنجیە. وتیان: داوا لەخوا بكە رەنگەكەیمان پێبڵێ. موسا وتی: خوا دەفەرمێت رەنگی زەرد و رۆشنە و بینەران شادمان دەكات. وتیان: داوا لەخوا بكە بزانە چۆن مانگایەكە چوونكە لای ئێمە تێكەڵە و بەخواستی خوا دەیدۆزینەوە. موسا وتی: خوا دەفەرمێت نەكاری زۆری كردووە و نە ڕەم وەك ئەوەی زەوی بكێڵێت و نەناو بۆسەر كێڵگە دەبات. لەهەر خراپەیەك پاك و خاوێنە — یانی ئیراد یا پەڵەی نییە- لەهەموو پێستەكەیدا جگە لەو رەنگە زەردە رەنگیتر نییە. وتیان: هەر ئێستاكە قسەیەكی شیاوت هێنایە سەرزمان. سەریان بڕی و نزیك بوو نەیكەن یا نەیدۆزنەوە، ئەوەندە پرسیاریان كرد و لێیان كۆڵییەوە و بەڵگەیان بەدەست هێنا (بقرە/٧١/٢). ئەو مانگایان دۆزییەوە بەڵام جگە لەمانگای ئەو پیاوە چاكەی لەگەڵ دایكی دەكرد، نەبوو. خوازیاری كڕینی بوون. ئەو بەردەوام بەهاكەی زیاد دەكرد تا پەیمانیان دا پێستەكەی پڕبكەن لەزێر و پێی بدەن. مانگایان سەربڕی و زمانیان لەكوژراوەكە دا. دەڵێن: ئەندامێكیتریان لەكوژراوەكەدا و هەستا وتی: فلان كەس منی كوشتووە، ئەوسا مرد.

## چارەنوسی منداڵەكانی ئیسرائیل لەبیابان و مردنی هاروون

خوا فەرمانی بەموسادا منداڵەكانی ئیسرائیل بەرەو شاری ئەریحا شاری یاخیان و ستەمكاران ببات كەسەرزەوینی بیت المقدسە. رۆشتن و نزیكی بوونەوە. لەم كاتەدا موسا دوانزە سەرپەرەستی دەستەی (نەقیب) لەكوڕەزاكانی منداڵەكانی ئیسرائیل نارد تا برۆن و لەچۆنییەتی بارودۆخی ستەمكاران و یاخیان ئاگادار ببنەوە. لەرێگادا پیاوێك لەو دەستە روبەرویان بوویەوە كەپێیان دەوت عەوجی كوڕی عێناق. ئەو هەر دوانزە كەسەكەی گرت و بردییە لای ژنەكەی خۆی و پێی وت: سەیری ئەم خەڵكانە بكە بەگومانی خۆیان دەیانەوێت لەگەڵ ئێمەدا شەڕ بكەن. ویستی لەژێر قاچدا بیانشێلێت بەڵام ژنەكەی رێگەی ئەم كارە لێگرت و وتی: بەرەڵایان بكە تا بگەڕێنەوە و ئەوەی بینیویانە بۆ خەڵكەكەی خۆیانی باس بكەن. ئەم كارەی كرد. كەهاتنە دەر بەخۆیان وت: ئەگەر منداڵەكانی ئیسرائیل لەوەی بینیوتانە ئاگادار بكەنەوە شەڕ لەگەڵ ئەم خەڵكە ناكەن، كەواتە با بەنهێنی بمێنێتەوە. ئەوان لەسەر ئەم بریارە هاوڕا بوون و گەڕانەوە بەڵام دە كەس لەوان پەیمانەكەی خۆیان شكاند و

ئەوی بینیبوویان گێرایانەوە و دووان لەوان ئەوەی بینیبوویان دایانشارد.ئەم دووانە یوشع کوری نون وکالب کوری یوفەننا زاواکانی موسا بوون. ئەوان جگە لەموسا و هارون کەسیان ئاگادار نەکردەوە. کاتێك منالەکانی ئسیرائیل بەسەرهاتی یاخیان و ستەماکارانیان بیست، لەرۆشتن بۆ شەڕ خۆیان دەدزییەوە. موسا پێی وتن: ئەی خەڵکانی من، بڕۆنە ناو سەرزەمینێکی پیرۆز کەخوا بۆ ئێوەی دیاریکردووە و مەگەڕێنەوە چوونکە دەچنە ریزی زیانکاران. وتیان: ئەی موسا، لەو سەرزەمینە خەڵکانێکی درندە و ستەمکار و کێو پەیکەر ژیان بەسەر دەبەن. ئێمە تا کاتێك ئەوان لەوێن، ناڕۆینە ناو ئەو شارە. بەڵام ئەگەر ئەوان بڕۆن ئێمە دەچین. دووانەکە (یوشەع و کالب) لەخوا دەترسان و خوا ئەوانی بەخشیبوو، وتیان: لەدەروازەکانەوە هێرشیان بکەنە سەر چوونکە ئەگەر ئەم کارە بکەن سەرکەوتوو دەبن. کاری خۆتان بەخوا بسپێرن ئەگەر لەباوەڕدارانن. ئیسرائیلیەکان وتیان: ئەی موسا، تا ئەو کاتەی ئەوان لەوێن، ئێمە ناڕۆین. تۆ بڕۆ لەگەڵ خواکەی خۆت (یا هارونی برات) شەڕیان لەگەڵدا بکەن و ئێمە لێرە چاوەڕوانین (مائدە/٥/٢١-٢٤).

موسا لێیان تووڕە بوو، لەخوا پاڕایەوە و وتی: خواوەندا، جگە لەخۆم و براکەم کەسم نییە، کەواتە جیابکەرەوە ئێمە لەگەڵ ئەم خراپەکارانە (مائدە/٥/٢٥). ئەم قسەیە موسا لەهەڵەشەییدا هێنایە سەرزمان. خوا فەرموی: ئەو سەرزەمینە بۆ ماوەی چل ساڵ لەوان حەرام بێت بەهەمان شێوە سامانیان ون کردبێت و رێگای هاتنە دەرەوە نەزانن. تۆ لەم دەستە خراپەکار خەم مەخۆ و ئازار بەخۆت مەگەیەنە (مائدە/٥/٢٦). لەم کاتەدا موسا لەوەی وتبووی پەشیمان بوویەوە. وتیان: لەم ماوە درێژەدا خواردن لەکوێوە بەدەست بێنین؟ خواوەند بۆ ئەوان تورەنگەبین و مریشکی برژاوی کەرجفو (سلوا، بلدرچین) (من و سلوا)ی نارد. لەبارەی (من) دەڵێن شتێك هاوشێوەی شیلەیە و تامەکەی شیرینە و لەسەرداره‌کان دەردەکەوێت. دەستەیەك دەڵێن تورەنگەبینە و دەستەیەك دەڵێن نانی ناسکە. ئەوانیتر دەڵێن: ئەنگەبین هەنگوینە کە بۆ هەرکام لەوان رۆژانە پیاڵەیەك دەنێردرا. سلوا باڵندەیەکە هاوشێوەی سەمانی (بلدرچین). وتیان: خواردنەوە لەکوێیە؟ لێرەدا خوا فەرمانی بەموسادا و داردەستەکەی لەتاشە بەردەێکدا کەدوانزە کانی لێهەڵقولا (بقره/٢/٦٠).

بۆ هەر تیرەیك كانییەك. وتیان: پەنا بۆ كام سێبەر ببەین؟ خوا هەوری بۆ ناردن و سێبەری بۆ دروست كردن. وتیان: جل و بەرگ لەكوێوە دروست بكەین؟ جلەكانی ئەوان درێژ دەبوو و نەدەدڕا. وتیان: ئەی موسا ئێمە ناتوانین بەردەوام یەك خواردن بخۆین. داوا لەخوا بكە بۆ ئێمە لەوەی لەزەویدا دیروێنێت بێنێتەدەر و ئێمە لەخەیار و گەنم و دانەوێڵە و پیاز رۆژی بدات. موسا وتی: ئایا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن كەخراپترە لەباشتر؟ لەم بیابانە برۆنە ناوشار تا ئەوەی داواتان كردووە بەئێوەی ببەخشن(بقره/٢/٦١).

موسا چاوی بەعوجی كوڕی عێناق كەوت. موسا دەگەز لەسەر زەوی پەڕی و داردەستەكەی ئەو دەگەز بوو و درێژی خۆی دەگەز و (بەم سی گەزە) داردەستەكەی گەشتە قولاپەی پێی عوجی كوڕی عێناق و كوشتی. دەڵێن عوجی كوڕی عێناق سێ هەزار ساڵ ژیا.

خواوەند وەحی بۆ موسا نارد: من گیانی هارون دەگرم. بەرەو فلان كێو برۆن. موسا و هارون بەرەو كێوەكە رۆشتن و بینیان دارێكی لێیە هاوشێوەی ئەو دارەیان نەبینیبو. ماڵێكیان بینی، تەختێكی تیابوو، لەسەر ئەو تەختە جێگایەك راخراوبوو كەبۆنێكی خۆشی لێ دەهات. كاتێك هارون بینی حەزی لێكرد و وتی: ئەی موسا دەمەوێت لەسەر ئەم تەختە بخەوم. موسا پێی وت: بخەوە. هارون وتی: لەخاوەنی ئەم ماڵە دەترسم ئەگەر بگەڕێتەوە و لێم تووڕە بێت. موسا وتی: مەترسە. پشتیوانی تۆم. هارون وتی: كەواتە لەگەڵ مندا بخەوە. كاتێك خەوتن، كاتی مەرگی هارون هات. كاتێك مەرگ ویستی گیانی بگرێت، وتی: ئەی موسا منت فریودا. ئەو مرد و تەختەكە بۆ ئاسمان بەرز كرایەوە. موسا بۆلای ئیسرائیلیەكان گەڕایەوە. ئەوان پێیان وت: تۆ هارونت كوشت چوونكە ئێمە خۆشمان دەویست. موسا وتی: هاوار لەئێوە! درۆ بۆ من هەڵدەبەستن كەبراكەم كوشتووە؟ كاتێك گفتوگۆیان درێژەی كێشا، نوێژی خوێند و لەخوا پاڕایەوە. خوا تەختەكەی نارده خوار و لەنێوان ئاسمان و زەوی رایگرت. هارون بەخەڵكی وت خۆم مردووم و موسا منی نەكوشتووە. و لێرەدا بوو قسەكەی موسایان بەراست زانی. مەرگی هارون لەبیاباندا بوو.

## مردنی موسا

دەڵێن: بەمشێوە بوو: ڕۆژێك موسا بەرێگادا دەڕۆشت و یوشەع کوڕی نون هاوڕێیەتی دەکرد. ئەو لەبیاباندا ونبوو. لەم کاتەدا با هەڵیکرد. کاتێك یوشع لێی ڕوانی، گومانی کرد ڕۆژی کۆتایی هاتووە. ئەو موسای بەبەهێزی گرت و وتی: تا من نزیك پێغەمبەری خوا بم ڕۆژی کۆتایی بەرپا نابێت. موسا لەژێر کراسەکەیەوە دەرکێشرا و کراسەکە لەدەستی یوشەع دا مایەوە. کاتێك بەکراسەکە گەڕایەوە لای منداڵەکانی ئیسرائیل، ئەویان گرت و وتیان: پێغەمبەری خوات کوشتووە! وتی: من ئەوم نەکوشتووە بەڵکو لەدەستی من کێشایانەدەر. قسەکەیان بەڕاست نەزانی. یوشەع وتی: ئەگەر باوەڕ بە قسەکەم ناکەن سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدەن. ئەوان چەندین کەسیان وەك پاسەوان بۆ دانا. یوشەع لەخوا پاڕایەوە و بەدوای ئەوە بۆ لای هەرکام لەپاسەوانەکان پەیامبەرێك لەلایەن خواوە هات و ئاگاداری کردنەوە کەیوشەع، موسای نەکوشتووە و ئێمە بردوومانەتەوە بۆ لای خۆمان. ئیسرائیلیەکان ئازادیان کرد.

دەستەیەك دەڵێن: موسا مەرگی پێ ناخۆش بوو. خوا مەبەستی ئەوەی کرد موسا مەرگی خۆش بووێت و لەبەر ئەمە، وەحی بۆ یوشەع کوڕی نون دەنارد. ئەو هەموو بەیانی و شەوێك سەردانی موسای دەکرد و موسا لەوی دەپرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمجارە خواوەند چ شتێکی تازەی بە تۆ بەخشیوە؟ کاتێك موسا ئەم پرسیارەی کرد، یوشەع کوڕی نون پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا من چەندین ساڵ هاوڕێیەتی تۆم نەکردووە؟ ئایا لەتۆم پرسی خوا چی لەگەڵدا باس کردی؟ یوشەع کوڕی نون لەمەدوا هیچی لەبارەی گفتوگۆی خۆی و خوای بۆ باس نەدەکرد. کاتێك موسا ئەمەی بینی، ڕەنجا و دڵی لەژیان هەڵکەند و دڵدادەی مەرگ بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەو بەتەنیایی لای چەند فریشتەیکەوە تێدەپەری کەگۆڕێکیان هەڵدەکەند. ئەوانی ناسیەوە و لایان ڕاوەستا و شتێکی جوانتر لەو گۆڕە و سەرسەوزییەکەی نەبینی. بەوانی وت: ئەی فریشتەکانی خوا، ئەم گۆڕە بۆ کێ هەڵدەکەنن؟ فریشتەکان وتیان: بۆ بەندەیەك کەلای خوا ڕێزدارە. موسا وتی: بێ گومان ئەم بەندە لای

خواوەندەکەی ڕێزدارە چوونکە ئارامگایەکی بەم خۆشیەم نەبینیوە. فریشتەکان وتیان: ئایا دەتەوێت ئەم ئارامگایە هی تۆ بێت؟ موسا وتی: ئارەزوومە. فریشتەکان وتیان: ئێستا برۆ ناو ئارامگاکە و ڕوو لەخوا بکە و بەئارامترین و ئاسانترین شێوە هەناسە بکێشە. موسا ڕۆشتە ناو ئارامگاکە و ڕوی لەخوا کرد و هەناسەی هەڵکێشا. خوا گیانی ئەوی گرت و دواتر فریشتەکان خۆڵیان کرد بەسەر ئارامگاکەدا و تەختیان کرد. موسا - سلاوی خوای لێبێت- پیاوێك بوو خۆپارێز، کەسێك پشتی لەجیهان کرد و رویکردە ئەوەی لای خوایە. ئەو لەژێر کەپرێکی داردا دەحەوایەوە و سێبەری هەڵدەبژارد و لەدەفرێکی قورس ئاوی دەخواردەوە و ئەوەندە لەبەرامبەر خوا لەخۆبووردو بوو، ئەم هەڵس و کەوتەی لەخۆی نیشان دەدا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: خواوەند فریشتەی مەرگی نارد تا گیانی بستێنێت بەلام موسا لێیدا و چاوی کوێر کرد. فریشتە گەرایەوە بۆ لای خوا و وتی: خوایە من بۆ لای بەندەیەك دەنێرێت ئارەزوومەندی مەرگ نییە. خوا فەرمووی: بگەرێرەوە و پێی بڵێ دەستی بخاتە سەر پشتی گایەکی نێر و بزانێت بەئەندازەی هەر تاڵێکی مو کە لەژێر دەستیدا بێت، یەك ساڵ ژیانی زیاد دەکەین. ئەوسا ئازادی بکە تا ئەو ژیانە درێژە هەڵبژێرێت یا بمرێت. فریشتەی مەرگ هات و پەیامەکەی خوای گەیاند و ئەوی سەرپشك کرد. موسا وتی: دوای ئەوە چی دەبێت؟ فریشتە وتی: مەرگ. موسا وتی: هەرئێستاکە گیانم بگرە. گیانی گرت. ئەم وتە راستەو بەگێرانەوەیەکی راست لەپێغەمبەر(د.خ) ئاماژەی پێدراوە. مەرگی ئەویش لەبیاباندا بوو.

دەستەیك دەڵێن: بەم شێوە نییە بەڵکو ئەو بوو کەشاری یاخیەکانی- ئاماژەی پێدەدەین- داگیرکرد. هەموو ساڵەکانەی تەمەنی موسا سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا. لەم ناوەدا بیست ساڵ لەسەردەمی پاشایەتی فەرەیدون و سەد ساڵ لەسەردەمی پاشایەتی مەنوچێهردا بوو. سەرەتای کاری ئەو لەوکاتەی خوا هەڵیبژارد تا ئەو کاتەی گیانی گرت لەرۆژگاری پاشایەتی مەنوچێهر بوو. دواتر یوشەع کوڕی نون بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردرا وئەو بیست ساڵ لەپاشایەتی مەنوچێهر ژیا و حەوت ساڵ لەپاشایەتی ئەفراسیاب.

## یوشەع کوڕی نون و داگیرکردنی شاری ستەمکاران

کاتێك موسا مرد، خوا یوشەع کوڕی نون کوڕی ئەفرایيم کوڕی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی وەك پێغەمبەر نارده لای منداڵەکانی ئیسرائیل و فەرمانی پێدا بەرەو شاری ئەریحا، شاری ستەمکاران بەرێکەوێت. زاناکان لەبارەی ئەوەی ئەم شارە بەدەست چ کەسێکەوە دەستی بەسەردا گیرا، بۆچوونەکانیان جیاوازە. عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: موسا و هارون لەبیاباندا مردن و هەر کەسێك هاتبووە ئەو بیابانە، لەوێ مرد. ساڵ لەبیست تێپەری یوشەع کوڕی نون و کالب کوڕی یوفەننا زیندوو بوون. کاتێك چل ساڵ تێپەری، خوا فەرمانی بەیوشەع کوڕی نون دا بەرەو شاری یاخیان بەرێکەوێت و دەستی بەسەردا بگرێت. ئەو دەستی بەسەردا گرت. قتادە و سەدی و عێکرمەیش بەم شێوەیان وتووە.

کەسانیتر دەڵێن: موسا ئەوەندە مایەوە تا لەبیابان رۆشتەدەر و گەشتە شاری یاخیان و فەرماندەی پێشرەوەی سوپاکەی یوشەع کوڕی نون بوو. موسا دەستی بەسەر ئەم شارەدا گرت. کوڕی ئسحاق دەڵێت: موسا کوڕی عیمران بۆ شەڕ لەگەڵ یاخیان، بەرەو سەرزەمینی کەنعان بەرێکەوت. لەمکاتەدا یوشەع کوڕی نون و کالب کوڕی یوفەننا (مێردی خوشکی موسا کچی عیمران) رۆشتنە پێش و کاتێك گەشتن، یاخیان لەدەوری بەلعەم باعوور- لەکورەزاکانی لووت- کۆبوونەوە و وتیان: موسا بۆ شەڕ لەگەڵ ئێمە و دەرپەڕاندنی ئێمە لەشارەکەمان هاتۆتە ئێرە. لەخوا بپارێرەوە. بەلعەم گەورەترین ناوی خوای دەزانی. بەلعەم بەوانی وت: چۆن لەخوا بپارێمەوە پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتوانی لەناو ببات لەکاتێکدا فریشتەکان هاورێیەتیان دەکەن؟ ئەوان چەندین جار هاتنە لای. ئەو هەر جار لەرازی بوون بەداواکەیان خۆی دوور دەخستەوە. ئەوان هاتنە لای ژنەکەی و دیاریان بۆ هێنا و ژنەکە رازی بوو ئەم داوایە لەهاوسەرەکەی بکات. داوایان لێکرد ئەم کارە لە بەرچاوی هاوسەرەکەی بەباش لەقەڵەم بدات و داوای لێبکات لەخوا بۆ لەناوبردنی منداڵەکانی ئیسرائیل بپارێتەوە. ژن ئەم باسەی لەگەڵ هاوسەرەکەی کرد بەلاَم رازی نەبوو. ژن بەردەوام

پێداگری کرد تا ئەوەی بەلعەم وتی: لەخوا بۆ ئەم کارە دەبێت فەرمان وەربگرم. داوای فەرمانی لەخوا کرد و خوا لەخەودا ئەوی لەم کارە دوور خستەوە. ئەم بەسەرهاتەی بۆ ژنەکەی باس کرد. ژن وتی: جارێکیتر داوا لەخوا بکە. ئەو جارێکیتر داوای فەرمانی کرد بەلام وەڵامی دەست نەکەوت. ژن وتی: ئەگەر خوا دەیویست تۆی دوور دەخستەوە. ئەو ژنە بەردەوام بەلعەمی فریو دەدا و بۆ ئەم کارە هانی دەدا تا بەلعەم باعوور وەڵامی یاخییەکانی دایەوە بەڵێنی پێدان ئەم کارەیان بۆ دەکات. سوار کەرێك بوو، ڕوی کردە کێوێك کەدەیڕوانییە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل تا لەسەری بێستێت و لەخوا بۆ لەناو بردنی منداڵەکانی ئیسرائیل بپاڕێتەوە و نفرینیان لێبکات. هێشتا ماوەیەك لەسەر کەرەکە نەڕۆشتبوو کە کەر خەوت. ئەو دابەزی و لەکەرەکەی دا تا هەستایە سەر پێ و سواری بوو. کەمێك ڕۆشت و دوبارە کەر کەوتە سەر ئەژنۆ. سێجار ئەم کارەی دووبارە کردەوە. کاتێك بۆ سێیەم جار بەتوندی لەکەرەکەی دا، کەر بەفەرمانی خوا هاتە قسە و وتی: هاوار لەتۆ بەلعەم، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ ئایا فریشتەکان نابینیت بەردەوام دەمگێڕنەوە؟ بەلعەم نەگەڕایەوە. لەم کاتەدا خوا کەرەکەی بەرەڵا کرد و بەلعەم سوار لەسەر کەر هات تا ئەو شوێنەی دەیڕوانییە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل. هەرجارێك دەیویست نفرینیان بکات زمانی لەبەرژەوەندی ئەوان دەسوڕا و دەهاتە گۆ. ئەوان هۆکاری ئەم کارەیان لێپرسی و بەلعەم باعوور وتی: ئەمە، کارێکە خوا لەسەری بەسەر ئێمەدا زاڵ بووە. ئەوسا زمانی دەرکێشرا وکەوتە سەر سینەی. بەلعەم وتی: ئێستا باشی ئەم دنیایە و ئەو دنیایە لەدەستم ڕۆشت و جگە لەفریو و فێڵ هیچ نەماوەتەوە. فەرمانی بەیاخیان دا ژنەکانی خۆیان برازێننەوە و کاڵای فرۆشتنیان پێبدەن تا بڕۆنە لای منداڵەکانی ئیسرائیل و فەرمانیان پێبدەن هەر کەس دەستی بۆ درێژ کردن لەخۆیانی دوور نەکەنەوە. بەلعەم بەیاخیانی وت: ئەگەر پیاوێك لەگەڵ یەکێك لەم ژنانە زینا بکات کارەکەی ئێوە بەهێز دەکەم. ئەم کارەیان کرد و ژنان هاتنە ناو لەشکری منداڵەکانی ئیسرائیل. پیاوێك بە ناوی زمری کوڕی شلوم – سەرۆکی تیرەی شەمعون کوڕی یەعقوب- ژنێکی گرت و هێنایە لای موسا و پێی وت: گومانم وایە دەڵێی ئەمە کارێکی نارەوایە. سوێند بەخوا فەرمانبرداری تۆناکەم. ئەوسا ئەو ژنەی بردە خێوەتەکەی خۆی و لەگەڵیا

جووت بوو. لەمکاتەدا خوا نەخۆشی تاعوونی بەسەر مناڵەکانی ئیسرائیل دابارند. فنخاس کوڕی ئەل عزار کوڕی هارون سەرپەرەستی کاروباری مامەی موسا ئامادە نەبوو. کاتێك بینی تاعون بڵاو بۆتەوە و لەناو منالەکانی ئیسرائیل جێگەی خۆش کردووە، لەو کارە ئاگادار بوویەوە – ئەو پیاوێکی بەهێز و سەختگیربوو- ویستی بڕواتە لای زمری. ئەوی لەباوەشی ئەو ژنەدا بینی. ئەو ڕمەی ل دەستیدا بوو کردی بەسکی هەردوکیانەوە و پێکەوە دووریینی و تاعون نەما. لەوکاتەدا بیست هەزار و بەوتەی دەستەیەك حەفتا هەزار لەمنالەکانی ئیسرائیل لەناوچوون. خوا ئەم ئایەی قورئانی لەبارەی بەلعەم باعوورەوە ناردووە: بۆ ئەوان بەسەرهاتی ئەو پیاوە بخوێنەرەوە کەنیشانەکانی خۆمانمان پێبەخشی و ئەو لێی هاتەدەر بەو شێوەی مار لەکراژەکەی دێتەدەر. شەیتان ئەوی کردە لایەنگیری خۆی و ئەو گومڕابوو(اعراف/٧/١٥٧).

دواتر موسا، یوشەع کوڕی نونی لەگەڵ منالەکانی ئیسرائیل بەرەو شاری ئەریحا نارد کەڕۆشتە ناو شارەکە و یاخیانی کوشت. کەمێك لەوان مانەوە. ئاوابوونی خۆر نزیك بوو. یوشەع ترسا شەو دابێت و یاخیان شکەستی پێبێنن یا ناتەوانی بکەن. داوای لەخوا کرد خۆریان بۆ رابگرێت. خوا ئەم کارەی کرد و خۆری ڕاگرت تا یوشەع هەموویانی لەناو برد و موسا هاتە ناو ئەو شارە بەوشێوەی خوا دەیویست. لەوێدا مایەوە و دواتر خوا ئەوەی بۆ لای خۆی بەرز کردەوە و ئێستا هیچ کەس ئارامگاکەی ئەو نازانێت.

بەلأم ئەوەی گومان دەکات موسا پێش ئەوە مرد، دەڵێت: خوا فەرمانی بەیوشەع دا بەرەو شاری یاخیان بەرێکەوێت بەلأم پیاوێك کەپێیان دەوت بەلعەم باعوور، لێی جیابوویەوە. ئەو گەورەترین ناوی خوایی دەزانی(درێژەی داستان باس کرا). کاتێك یوشەع بەسەر یاخیاندا زاڵ بوو، شەو داهات و ئەو شەوە شەوی شەممە بوو. یوشەع کوڕی نون داوای لەخوا کرد و خوا خۆری گەڕاندەوە و کاتژمێرێك ڕۆژی زیاتر کرد. یوشەع شکەستی بەیاخیان هێنا و هاتە ناو شارەکەی ئەوان و تالأنییەکانی کۆکردەوە تا ئاگری قوربانی بیانگرێتەوە بەلأم ئاگر نەهات و یوشەع وتی: لەناو ئێوەدا خیانەتکارێك هەیە، لەگەڵ مندا بەیعەت بکەن. ئەوان بەیعەتیان لەگەڵدا کرد و

دەستی ئەو بەدەستی ئەو کەسەی خیانەتی کردبوو، لکا. ئەو پیاوە سەری مانگایەکی زێرین و رازاوە بەیاقوتی هێنا. یوشەع ئەوەی لەگەڵ سەری مانگاکە کردە ناو قوربانی و ئاگرهات و هەمووی خوارد.

دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوەنییە، بەلکو یوشەع کوڕی نون شەش مانگ، ئەوشارەی گەمارۆدا و کاتێك مانگی حەوتەم هات، هەموویان رویانکردە شار و پێکەوە بانگێکی یەك دەستیان بەرز کردەوە و قەڵای شارەکە روخا. ئیسرائیلیەکان رۆشتنە ناو شارەکە و یاخیانیان کوشت و لەناو ئەواندا کوشتارێکی فراوانیان کرد. ئەوسا دەستەیەك لەپاشاکانی شام کۆبوونەوە و ویستیان لەگەڵ یوشەع کوڕی نون شەڕ بکەن. یوشەع بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان خۆی ئامادە کرد و ئەوانی تێکشکاند و پاشاکان رایانکردە ئەشکەوتێك. یوشەع فەرمانیدا ئەوانیان کوشت و لەداریان دان. ئەوسا یوشەع سەراسەری شامی گرت و هەمووی بوو بەملکی منالەکانی ئیسرائیل و ئەو فەرماندارەکانی خۆی بۆ شارەکان نارد. دواتر خوا ئەوی مراند و کالب کوڕی یوفەننای کردە جێگری. دەست بەکار بوونی ئەو بیست و حەوت ساڵ دوای موسا بوو.

بەلام ئەو کەسانەی لەیاخییەکان مانەوە، ئەفریقش کوڕی قەیس کوڕی سەیفی کوڕی سەبا کوڕی کەعب کوڕی زەید کوڕی حەمیر کوڕی سەبا کوڕی یەشجب کوڕی یەعرەب کوڕی قەحتان کەبەرەو ئەفریقا دەرۆشت، لایانەوە تێپەری و ئەوانی لەقەراغەکانی شام کۆکردەوە و لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەفریقای بردن و دەستی بەسەر سەرزەمینەدا گرت و پاشاکەی جرجیر(کوڕی حەمیر)ی کوشت و ئەوانی لەوێ نیشتەجێ کرد. ئەوانە ئەو کەسانەن ئەمرۆکە پێیان دەوترێت بەربەر. لە حەمیر سەنهاجە و کەتامە لەناو بەربەرەکان مانەوە کە تا ئەمرۆ لەوێن.

## داستانی قارون

ئەو قارون کوڕی یەسهر کوڕی قاهس کوره مامی موسا کوڕی عیمران کوڕی قاهس بوو. دەڵێن: مامی موسا بوو بەڵام وتەی یەکەم ڕاستترە. ئەو سامانی زۆر و گەنجی بێ کۆتایی کۆکردبوویەوە. دەڵێن: کلیلی گەنجخانەکانی ئەو لەسەر پشتی چل ئێستر دەبرا. ئەو لەرێگەی سامانی زۆر ستەمی لەخەڵك دەکرد. ئامۆژگارییان کرد و لەکاری نارەوا دووریان دەخستەوە و پێیان وت خوای گەورە داستانەکەی لەکتێبەکەیدا باس کردووە: بەوەی لەم دنیا هەتە شادمان مەبە چوونکە خوا شادمانان بەم جیهانەی خۆش ناوێت. و بەوەی خوا بە تۆی داوە، بەدوای جیهانێکیتردا بگەرێ و بەو شێوەی خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە، لەگەڵ خەڵکدا چاکە بکە و لەسەر زەوی بەدوای خراپەکاریدا مەگەرێ کە خوا خراپەکارانی خۆش ناوێت (قصص/٧٧/٢٨). هاوشێوەی لەخۆرازیان وەڵامی دەدایەوە چوونکە خوا لەسەر بنەمای خۆراگری خۆی هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد. وتی: ئەم هەموو سامانەم لەزانست و زانیاری خۆمەوە بە دەست هێناوە یانی سامان و گەنجەکانم لەلێهاتویی و ئاشنایی خۆم بەدەست هێناوە. دەستەیەك دەڵێن دەیویست بڵێت: ئەگەر خوا لەمن رازی نەدەبوو و لەپێشی منی نەدەویست، ئەمانەی بەمن نەدەدا. ئەو لەگومڕایی خۆی نەگەرایەوە و پێیداگرت تا ئەوەی بە هەموو زێر وزیوەکەی خۆی هاتە لای خەڵکەکەی (قصص/٧٩/٢٨).

بەسەرهاتەکە بەمشێوە بوو: سوار ئەسپێکی سپی بەساز وبەرگی ئەرخەوانی رەنگ و زێرنیگار بوو، جلێکی زەردی رۆشنی لەبەر کرد و سێسەد کەنیزی لەگەڵ خۆی برد کە لەسەر ئەسپی هاوشێوەی ئەسپەکەی خۆی سواربوون و چوار هەزار لەهاورێکانی هاورێیەتیان دەکرد. بۆ خۆی ماڵێکی دروست کرد وخشتی زێرینی تیا بەکاربرد و درگایەکی زێرینی بۆ دروست کرد. لەوکاتەدا نەزانەکان و ئاناگاکان ئارەزویان کرد سامانێکی هاوشێوەیان هەبێت بەڵام ئەوانەی لەنهێنییەکان ئاگاداربوون و زانستی خواییان پێبڕابوو، ئەوانیان لەم کارە دوور دەخستەوە.

خوای گەورە فەرمانی دانی زەکاتی پێدا. ئەو لەهەر هەزار دینار یەك دینار و لەهەر هەزار شتێکیکتر یەکێکی هێنا بۆ لای موسا بەڵام کاتێك گەرایەوە بۆماڵ بەزیادی زانی و لەبەر ئەمە دەستەیەك لەمناڵەکانی ئیسرائیلی لای خۆی کۆکردەوە و پێیانی

وت: موسا هەر فەرمانێکی بەئێوەدا، فەرمانبرداریتان کرد و ئێستا دەیەوێت دەست بەسەر سامانی ئێوەدا بگرێت. وتیان: تۆ گەورە و سەروەری ئێمەیت. فەرمان بدە. وتی: فەرمانتان پێدەدەم فلآن ژنی داوێنپیس بێنن و زێری پێبدەن تا بڵێت موسا نزیکی لەگەڵ کردووم. ئەم کارەیان کرد و ئەو ژنە ولآمی رازی بوو ئەو کارەیان بۆ بکات.

قارون هاتە لای موسا و وتی: خەڵکی تۆ کۆبوونەوە تا ئامۆژگاریان بکەیت. موسا هاتەدەر و لەناو ئەواندا بۆ وتار خوێندنەوە وەستا، وتی: هەرکەس دزی بکات دەستی دەبڕین و هەرکەس بووختان بۆ یەکیتر هەڵبەستێت، قامچی لێدەدەین و هەر کەس زینا بکات ئەگەر ژنی نەبێت سەد قامچی لێدەدەین و ئەگەر ژنی هەبێت، بەردبارانی دەکەین. قارون هەستا و وتی: تەنانەت ئەگەر خۆیشت بیت؟ موسا وتی: بەڵێ. قارون وتی: منداڵەکانی ئیسرائیل گومان دەکەن تۆ لەگەڵ فلآن ژنی داوێنپیس تێکەڵ بوویت. موسا وتی: بانگی بکەن ئەگەر شایەتی بەم کارەدا ، پێی رازی دەبم.

کاتێك ژنەکەهات موسا پێی وت: تۆ بەو کەسەی تەوراتی نارد سوێند دەدەم راستی بڵێیت. ئایا من ئەو کارەم لەگەڵ کردوویت کە ئەمانە دەیڵێن؟ ژن وتی: نە، درۆیان کرد و زێریان بەمندا تا ئەو بوختانە بۆتۆ هەڵبەستم. موسا سەری خستە سەرزەوی و لەخوابۆ لەناوچوونی ئەوان پاڕایەوە.

خوا وەحی پێکرد: هەرچیت دەوێت فەرمانەکەی بەزەوی بدە. موسا وتی: ئەی زەوی، قوتیان بدە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم باسە بەموسا گەشت و ئەو داوای لەناوچوونی قارونی لەخوا کرد و خوا وەحی پێکرد: فەرمان بە زەوی بدە تا خواستەکەی تۆ بێنێتەدی. موسا هاتە لای قارون و کاتێك گەشت، قارون توڕەیی لەچاوی ئەودا بینی و بەموسای وت: ئەی موسا لەمن خۆشبە. موسا وتی: ئەی زەوی قوتیان بدە. ماڵەکە لەرزی و زەوی قولاپی پێی قارون و هاوەڵانی گرت. قارون بەردەوام دەیوت: ئەی موسا، لێم خۆشبە و موسا دەیوت: ئەی زەوی قوتیان بدە. بەمشێوە بوو تا زەوی قوتی دان. خوا وەحی بەموسا کرد: چەندە دڵرەق و بێ بەزەییت! سوێند بەگەورەییم ئەگەر داوای لێخۆشبوونی لەمن دەکرد، دەمبەخشی. چیتر زەوی ناکەمە فەرمانبرداری هیچ

کەسێك. زەوی تا ئێستا بەردەوام بۆناوخۆیان دەبات. کاتێك خوا سزاکەی خۆی نارد، باوەڕداران سپاسی خوایان کرد و ئەوانەی دوێنێ ئارەزووی پێگەی قارونیان لەسەردابوو، هەستیان بەهەڵەی خۆیان کرد.

## پاشاکانی ئێران دوای مەنوچێهر

کاتێك مەنوچێهر مرد، ئەفراسیاب کوڕی فشەنج (چشەنگ) کوڕی رۆستەم پاشای تورکان (توران زەمین) هێرشی کردە سەر ئێران زەمین و بەسەریدا زاڵ بوو و تا سەرزەوینی بابلی گرت و رۆژگارێکی درێژ لەو شارە لە(میهرجانقەزەق) مایەوە و لەئێران خراپەکاری و ستەمکاری کردە پیشە. ئەوەی ئاوەدان بوو کردیە وێرانە و رووبار و کارێزەکانی بەخاك و خۆڵ پڕ کردەوە. خەڵك لەپێنجەمین ساڵی پاشایەتی ئەو تائەو کاتەی لەئێران رۆشت، گیرۆدەی وشکەساڵی و قات و قڕی بوون. خەڵك بەردەوام لەدەست ئەو لەرەنجێکی گراندا بوون تا(زوو) کوری تەهماسب پاشایەتی گرتەدەست. پێش ئەمە مەنوچێهر، لەکوڕەکەی تەهماسب توورە و ئەوی لەولاتەکەی دوور خستبوویەوە. تەهماسب لەسەرزەمینی تورکان لای پاشایەك کەپێیان دەوت(وامن) مایەوە و کچەکەی ئەوی بەژنی هەڵبژارد کەزووی بۆ هێنایە دونیا. ئەستێرەناسەکان بەباوکی کچەکەیان وتبوو: کچەکەت کورێکی دەبێت کەتۆ دەکوژێت. ئەو کچەکەی خۆی خستە زیندانەوە. کاتێك تەهماسب ئەوی بەژنی هەڵبژارد کورێکی بۆ هێنایە دونیا، کار و بەسەرهات و چارەنوسی منالەکەی خۆیان داشارد. دواتر مەنوچێهر لەتەهماسب خۆش بوو و ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کردەوە. تەهماسب رێگە چارەی دۆزییەوە و ژن و منالەکەی لەزیندان رزگار کرد. ژنەکەی پەیوەستی بوو. بەوشێوەی دەڵێن زوو باوەگەورێی خۆی کوشت و لەیەکێك لەشەڕەکان ئەمانی بەتورکان بەخشی و ئەفراسیابی تورك ئەژادی لەئێران دەرپەراند تا ئەوەی دوای چەندین شەر ناچاری کرد بگەرێتەوە بۆ سەرزەمینی تورکەکان (توران). زاڵبوونی ئەفراسیاب لەسەر پانتاییەکانی بابل و ولاتی ئێران دوانزە ساڵ لەمردنی مەنوچێهر تا دەرکرانی ئەو لەسەر دەستی زوو درێژەی کێشا دەرپەراندنی ئەو لەرۆژی ئابان لەمانگی ئابان بوو. ئەو ئەم رۆژەی بۆئێرانییەکان کردە جەژن و دوای ئەورۆز و میهرەگان، کردیە سێیەم جەژنی ئێران و بە(ئابانگانی) ناوبرد.

زوو پیاوێکی چاك و لەگەڵ خەڵگ بەباشی هەڵسوکەوتی دەکرد. فەرمانیدا ئەوەی ئەفراسیاب لەولاتەکەی وێرانی کردبوو، ئاوەدان بکەنەوە و قەلاکان سەرلەنوێ

دروست بکەنەوە و ئەو ناوانەی پڕکرابوونەوە، دووبارە هەڵیانبکەنەوە. وڵات بۆ شێوەی جوانتر لەپێشوی خۆی گەڕایەوە و بۆ ماوەی حەوت ساڵ باجی لەسەر خەڵك هەڵگرت. ئێران زەمین لەرۆژگاری ئەو ناوەدان بوویەوە و رۆژییەکان فراوان بوون. ئەو لەسوادی عێراق روبارێکی هەڵکەند و ناوی نا زاب و لەقەراغ ئەودا شارێکی دروست کرد کەپێی دەڵێن عەتیقە. یەکەم کەس بوو خواردن و خۆرشتە(شلە) جۆراوجۆرەکانی هێنایە ناراوە و ئەوەی لەتورکان و کەسانیتر وەك تالآنی دەستی کەوتبوو، لەناو سوپاکەیدا دابەشی کرد.

هەموو پاشایەتی ئەو سێ ساڵ درێژەی کێشا. گرشاسب کوڕی ئەنوت وەزیر و یاری ئەو لەجیهانداری بوو. دەستەیەك دەڵێن: شەریکی ئەو لەپاشایەتیدا بوو، بەلآم وتاری یەکەم راستترە. ئەو لەناو ئێرانییەکان پێگەیەکی بەرزی هەبوو بەلآم لەسەر تەختی پاشایەتی دانەنیشت.

## پاشایەتی کەیغوباد

دوای زوو کەیغوباد کوڕی راع کوڕی میسرە کوڕی نەوزەر کوڕی مەنوچێهێر پاشایەتی گرتەدەست و ئاوی روبار و کانی و کارێزەکانی ئەندازە بەخشی و سەروسامانی پێدا. شارەکانی ناونا و سنورەی شارەکانی دیاری کرد. لەدانەوێڵە بۆ خوراردنی سوپاییەکان دە یەکی وەرگرت و بەوشێوەی دەڵێن، خوازیاری ئاوەدان کردنەوەی وڵات بوو. پارێزگاری ئێران زەمینی لەبەرامبەر دوژمنانی کرد و گەنجی فراوانی بۆ خۆی کۆکردەوە. دەڵێن: پاشاکانی کیانی لەنەژادی ئەو بوون. لەنێوان ئەو و تورکەکان چەندین شەڕ روویدا. لەنزیکی روباری بەلخ — کە هەمان جەیحونە — مایەوە تا رێگەی دەستدرێژی کردنی تورکەکان بۆ سەر وڵاتەکەی بگرێت. رۆژگاری پاشایەتی ئەو سەد ساڵی خایاند.

## چارەنوسی ئیسرائیلیەکان لەرۆژگاری پاشایەتی کەیقوباد و زوو و پێغەمبەری حەزقیل

کاتێك یوشەع کوڕی نون مرد، دوای ئەو کالب کوڕی یوفەننا بۆ سەرپەرەستی کاروباری منالەکانی منالەکانی ئیسرائیل راسپێردرا. دواتر حەزقیل کوڕی نون ئەم کارەی گرتەدەست. ئەو، ئەو کەسەیە پێی دەڵێن ((کوڕی العجوز)) منالی پیرێژن. لەبەر ئەمە بەم ناوە بانگیان دەکرد چوونکە دایکی لەسەردەمی پیری داوای منالی لەخوا کرد و خوا حەزقیلی پێبەخشی. ئەو کەسە بوو بانگی کۆمەڵێك لەمردووەکانی کرد و خوا ئەوانی زیندوو کردەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو: لەدێهاتێك کەپێیان دەوت راورواره (راوودان، واوودان، راوودان)تاعون بلاو بوویەوە و زۆربەی خەڵك شارەکەیان بەجێهێشت و لەپانتاییەکی دیکە نیشتەجێ بوون. خەڵکانی دێهات زۆربەیان لەناوچوون و ئەوانیتر رزگاریان بوو. کاتێك تاعون نەما، گەڕانەوە. ئەوانەی لەدێ دا مابوونەوە وتیان: هاورێکانی ئێمە دوورئەندێشتر لەئێمە بوون و ئەگەر ئێمەیش هاوشێوەی ئەوانمان دەکرد، گرفتاری ئەم مەرگ و میرە نەدەبووین. دوای ئەوە تاعون کەوتە قابل (بابل) و زۆرینە یا هەمووی خەڵکی —سی و چەند هەزار یا سێ هەزار کەس بوون (وتراوە چوار هەزار کەس بوون و شتی تر و ئاماری تریش ئاماژەی پێدراوە)- لەوێ رایان کرد و لەهەمان پانتایی نیشتەجێ بوون. لەم کاتەدا فریشتەی مەرگ بانگی کردن. هەموویان مردن و ئێسقانەکانیان ڕزا و بلاو بوونەوە. حەزقیل لایان تێپەری و کاتێك ئەوانی بینی، بەبیرکردنەوە لەبارەی چۆنییەتی هەستانەوەیان سەرقاڵ بوو. خوا وەحی پێکرد: ئایا دەخوازیت نیشانتی بدەم چۆن زیندوویان دەکەمەوە؟ وتی: بەڵێ. پێی وترا: بانگیان بکە. حەزقیل بانگی کردن: ئەی ئێسقانە ڕزیو و بلاوەکان، خوا فەرمانتان پێدەدات کۆببنەوە. ئێسقانەکان رۆشتنە لای یەك تا بوونەوە بەئێسکە پەیکەر. دواتر بانگی کرد: ئەی ئێسقانەکان خوا فەرمانتان پێدەدات داپۆشرێن و ئێسقانەکان بەگۆشت و خوێن داپۆشران و ئەو جلانەی تیایدا مردبوون، لەبەریان کرایەوە. ئەوکات بانگی کرد: ئەی گیانەکان خوا فەرمانی گەڕانەوەتان

پێدەدات. گیانەکان هاتنەوە و پەیکەرەکان زیندوو بوونەوە و لەشوێنەکەیان هەستان. کاتێك زیندو بوونەوە وتیان: تۆ پاکی خواوەندا و ئێمە تۆ دەپەرەستین و جگە لەتۆ کەس بەخوا نازانین. ئەوان زیندوو گەڕانەوە لای خەڵکەکەی خۆیان. خەڵکەکەیان دەیانزانی ئەوان پێشتر مردبوون. سێبەری مەرگ لەسەر روخساریان بوو و جلیان لەبەر نەدەکرد مەگەر ئەوەی دەبووە کفنێکی ڕزاو و کۆن و چڵکن و دواتر هەموویان مردن و ئەوسا پێغەمبەری خوا، حەزقیل مرد. رۆژگاری مانەوەی ئەویان لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل نەنوسیوە. دەستەیەك دەڵێن: ئەوان خەڵکەکەی حەزقیل بوون و کاتێك مردن حەزقیل گریا و وتی: خوایە من لەناو خەڵکانێك بووم بیری تۆیان دەکردەوە و تۆیان دەپەرەستی و ئێستا بەتەنیا ماومەتەوە. خوا فەرمووی: ئایا دەتەوێت زیندوویان بکەمەوە؟ حەزقیل وتی: بەڵێ. خوا فەرمووی: ژیانی ئەوانم بەتۆ سپارد. حەزقیل وتی: زیندوو ببنەوە بەفەرمانی خوای گەورە و زیندوو بوونەوە.

## بەسەرهاتی ئەلیاس

کاتێك حەزقیل مرد، ئاڵۆزی و پەرێشانی لەنێوان منالەکانی منالەکانی ئیسرائیل زیادی کرد و پەیمانی خوایان شکاند و رویان کردە بتپەرەستین. خواوەند ئەلیاس کوڕی یاسین کوڕی فنخاس کوڕی ئەل عزار کوڕی هارون کوڕی عیمرانی وەك پێغەمبەر ڕەوانە کرد. پێغەمبەرەکانی منالەکانی ئیسرائیل دوای موسا کوڕی عیمران بۆ تازە کردنەوەی ئەوەی لەتەورات لەبیرکرابوو، هاندران. ئەلیاس هاورۆژگاری پاشایەك لەوان بوو کەپێیان دەوت ئەخاب (ئەحاب). ئەم پاشایە گوێی لەقسەی ئەو دەگرت و وتەکانی بەراست دەژمارد. ئەلیاس کاروبارەکانی بۆ رادەپەڕاند. منالەکانی، منالەکانی ئیسرائیل بتێکی بەناوی بەعلیان دەپەرەستی و ئەلیاس ئەوانی بۆ خواپەرەستی بانگێشت دەکرد بەلام ئەوان جگە لەو پاشایە قسەی کەسیان نەدەبیست. پاشاکانی منالەکانی ئیسرائیل بەربلاو بوون: هەر پاشایەك بەسەر پانتاییەك زاڵ ببوو، تالانی دەکرد و دەیخوارد. جارێك ئەو پاشایەی لەگەڵ ئەلیاس

بوو، پێی وت: بەخوا ئەوەی باسی دەکەیت جگە لەهەڵێت وپڵێت نییە چوونکە فلآن کەس و بەهمانە کەس (بەناوبردنی چەند کەس لەپاشاکانی منالّەکانی ئیسرائیل) دەناسم کەبتەکانیان دەپەرەستی و ئەم کارە هیچ زیانێکی پێنەگەیاندن و ئێستا دەخۆن و دەخۆنەوە و خۆش رادەبووێرن و بت پەرەستی و خۆشگوزەرانی، زیان لەژیانی ئەم دنیایان نادات و ئێمە بەهیچ شێوەیەك باشتر لەوان نین.

ئەلیاس بەدەم وتنی (انا لله و انا الیه راجعون) بەجێیهێشت. پاشا رووی لەبتپەرەستی کرد. پاشا دراوسێیەکی خواپەرەستی بوو کەباوەڕی خۆی دەشاردەوە. ئەو لەپاڵ دەرباری پاشا بێستانێکی بوو و پاشایش رێزی دراوسێیەتی ئەوی دەگرت. پاشا ژنێکی نیهاد پیس و بەد سرشتی بوو کەباوەڕی بەخوا نەبوو. ژن بەمێردەکەی خۆی وت: بێستانی ئەو پیاوە داگیر بکە. پاشا ئەم کارەی نەکرد. ئەو ژنە لەکاتی دوور کەوتنەوەی هاوسەرەکەی دەبووە جێگری و لەبەر چاوی خەڵك دەردەکەوت. جارێك پاشا رۆشتە دەر و ژنەکەی بوو بەجێگری و کەسێکی لای خاوەنی بێستان دانا تا شایەتی بدات کەجنێو بەپاشا دەدات. ژن ئەوی کوشت و بێستانەکەی زەوت کرد. کاتێك پاشا گەرایەوە، لەکاری ژنەکەی توورە و بەنارەوای زانی. ژن وتی: کار لە کار ترازا. خوا وەحی بەئەلیاس کرد بە پاشا و ژنەکەی بڵێت بێستانەکە بگەرێننەوە بۆ میرات هەڵگرانی ئەو پیاوە و ئەگەر ئەم کارە نەکەن خوا لێیان تورە دەبێت و هەردووکیان لەناو بێستانەکە لەناو دەبات و تەنیا کەمێك لەبەرهەمی ئەو بێستانە دەخۆن.

ئەلیاس پەیامەکەی خوای گەیاند بەلآم ئەو دووانە بۆ لای راستی نەگەڕانەوە. کاتێك ئەلیاس بینی منالّەکانی ئیسرائیل لەسەر ستەم و لەبەرچاو نەگرتنی خوا پێدادەگرن، لە وا بۆ لەناوچوونی ئەوان پارایەوە و خوا سێ ساڵ بارانی لەوان گرتەوە. ئاژەڵەکان، باڵندەکان و چوارپێکان و خزۆکە بێ زیانەکانی ئەوان زۆربەیان مردن و ڕومکەکانیان سیس بوون و ژاکان. ئەلیاس لەترسی منالّەکانی ئیسرائیل خۆی داشارد بەلآم رۆژی ئەو لەلایەن خواوە دەگەشت. شەوێك رۆشتە مالّی ژنێك لەئیسرائیلیەکان، ژنەکە کوڕێکی بەناوی ئەیسەعی بوو، نەخۆشییەکی کوشندە بەرۆکی گرتبوو. ئەلیاس لەم زەمانەدا پیر ببوو. خوا وەحی پێکرد: تۆ زۆربەی خەڵکان و خشۆك و خزۆکەکان و

چوارپێ و باڵندەکانی ئەوانت لەناو برد لەکاتێکدا تەنیا منداڵەکانی ئیسرائیل گوناحیان کردبوو. ئەلیاس وتی: خوایە، ڕێگە بدە ئەوە من بەم ئەوان بۆ پەرستینی تۆ هان بدەم و تۆوی شادمانی لەدڵیاندا بچێنم بەڵکو بۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێنەوە. (خوا دەستووریدا) ئەلیاس هاتە لای ئەوان و وتی: ئێوە لەناوچوون و گیانلەبەرەکان بەتاوانی ئێوە لەناوچوون. ئەگەر دەخوازن بزانن و ئاگادار بن کەخوا لەئێوە توڕەیە و لەکاری ئێوە نارازی و ئەوەی من بەئێوەی دەڵێم ڕاستە. بتەکانی خۆتان بێنەدەر و بانگیان بکەن ئەگەر وڵامیان دانەوە ئەوە شیاوی پەرستنن بەڵام ئەگەر بتەکان وڵامیان نەدایەوە، بزانن لەسەر ڕێگەی چەوتی و گومڕایین. لەبتپەرستی دەست هەڵگرن و داوا لەخوادەکەم فراوانی بۆ ئێوە بخولقێنێت و بەلا لەئێوە دوور بکاتەوە. وتیان: ویژدانییە ئەم کارەی تۆ. بتەکانی خۆیان هێنایەدەر و بانگیان کردن بەڵام وڵامیان نەبیست و کرانەوەیەك لەکارەکەیان دورست نەبوو. بەئەلیاسیان وت: ئێمە لەناوچوین. لەخوا بۆ ئێمە بپاڕێرەوە. ئەلیاس لەخوا پاڕایەوە تا فراوانی ڕۆژییان پێببەخشێت و بارانیان بۆ ببارێنێت. لەم کاتەدا هەورێك هاوشێوەی قەڵغانێك لەئاسمان دەرکەوت و ئەوان سەیریان دەکرد. خوا لەو هەورە بارانی دابارند و شارەکانیان ئاوەدان بوویەوە. خواوەند ئەو بەلایەی بەسەریدا سەپاندبوون، لەسەری هەڵگرتن. دەستیان لەبتپەرستی هەڵنەگرت و بۆلای ڕاستی و پاکی نەگەڕانەوە. کاتێك ئەلیاس ئەمەی بینی، داوای لەخوا کرد گیانی بستێنێت و لەزیانی ئەوان دووری بخاتەوە. خواوەند ئەوی بەپەڕ داپۆشی و لەڕوناکییەوە پێچا و خۆشی خواردن و خواردنەوەی لێسەندەوە. ئەو بوو بەفریشتەیەکی خەڵکی و پیاوێکی ئاسمانی زەمینی. خوا دوژمنێکی بەسەر ئەو پاشا و خەڵکەدا زاڵ کرد کەبەسەریاندا زاڵ و پاشا و ژنەکەی کوشت و لەهەمان بێستان فڕیدان تا گۆشتەکەیان برزێت و بۆگەن بکات.

## پێغەمبەر (د.خ)ی ئەلیەسع و وەرگێرانەوەی تابووت لەمناڵەکانی ئیسرائیل

کاتێك ئەلیاس لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل نەما، خواوەند ئەلیەسعی بۆ پێغەمبەری دیاری کرد وئەو، رۆژگارێکی درێژ لەناویاندا مایەوە. دواتر خوا گیانی ئەوی گرت و ئاڵۆزی و پەرێشانی لەناو مناڵەکانی، مناڵەکانی ئیسرائیل زیادی کرد. تابووت لەناو ئەواندا بوو، لەیەکتر بەمیرات بۆیان دەمایەوە و تیایدا ئارامشێك بوو و پاشماوەیەك بوو لەوەی بنەماڵەی موسا و بنەماڵەی هارون بەجێیان هێشتبوو. فریشتەکان بۆ ئەم لاو لایان دەبرد. رۆژگاری ئەوان بەمشێوەبوو: لەگەڵ هەر دوژمنێك شەڕیان دەکرد. ئەگەر تابووت لەناو ئەواندا بووایە بەسەر دوژمندا زاڵ دەبوون و خوا ئەو دوژمنەی تێکدەشکاند. (ئارامش)وەك سەری پشیلەیەك بوو، کاتێك لەناو تابووتەکەوە وەك پشیلە دەیمیاواند، لەسەرکەوتن دڵنیا دەبوون و سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. دواتر لەناو ئەوان پیاوێك پاشایەتی گرتەدەست کەپێیان دەوت ئیلاف. خوا ئەوانی دەپاراست و پارێزگاری لێدەکردن. کاتێك ئاڵۆزییەکان لەناو ئەواندا زیادی کرد، دوژمنێك هێرشی کردە سەریان. بەمەبەستی رووبەروو بوونەوەی دوژمن بەرێکەوتن و تابووتەکەیان لەگەڵ خۆیان برد. شەر دەستی پێکرد و دوژمن بەسەریاندا زاڵ بوو وتابووتەکەی لێسەندن و مناڵەکانی ئیسرائیل شکستیان خوارد. کاتێك پاشا زانی تابووتەکەیان ڕفاندووە، لەئازار و خەمدا مرد. دوژمن هاتە ناو سەرزەمینەکەی، تالآنی کرد و کەسانی زۆری بەدیلی گرت و گەرایەوە. ئەوان بەو پەرێشانی و ئاڵۆزییە رۆژگاریان بەسەردەبرد و لەسەر گومرایی خۆیان سوور بوون. خوا کەسێکی بۆ دەناردن تا رۆژگاریان رەش بکات. کاتێك بۆ لای خوا دەگەڕانەوە، خوا زیانی دوژمنی لەسەر هەڵدەگرتن. لەرۆژگاری مردنی یوشەع کوڕی نون ژیانیان بەم شێوە بوو تا ئەوەی خواوەند ئەشمویلی وەك پێغەمبەر هەڵبژارد و تالوتی کردە پاشای ئەوان و ئەو تابوتی بۆ گەڕاندنەوە.

ئەم رۆژگارە ٤٦٠ ساڵی خایاند و ئەمە لەمردنی یوشەع کوڕی نون دەستی پێکرد. لەو کاتەوە هەندێ کات داوەران فەرمانڕەوایی مناڵەکانی ئیسرائیلیان لەدەستدا بوو و هەندێ کات پاشاکان فەرمانڕەوایەتیان دەکرد و هەندێ کات دوژمنان تا ئەوەی

پاشایەتی لەناو ئەواندا بەهێز و پێغەمبەرایەتی ئەشمویل دەستی پێکرد.

یەکەم کەس بەسەر ئەواندا زاڵ بوو، پیاوێك لەرەگەزی لوت بوو کەپێیان دەوت، کوشان. کوشان ئەوانی سەرکوت کرد و بۆ ماوەی هەشت ساڵ ریسوایی کردن. برای کالبی گەورە کەپێیان دەوت عەتنیل، ئەوانی رزگار کرد و بۆ ماوەی چڵ ساڵ فەرمانرەوایەتی کردن.

دواتر پیاوێك بە ناوی عەجلون بەسەر ئەواندا زاڵ بوو و هەژدە ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. ئەوسا پیاوێك لەتیرەی بنیامین ئەوانی رزگار کرد کەپێیان دەوت ئەهوز و بۆ ماوەی هەشتا ساڵ پاشایەتی لەدەستا بوو.

دوای ئەوە پیاوێك لەکەنعانییەکان کەپێیان دەوت یابین، بەسەریاندا زاڵ بوو و بیست ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد بەڵام ژنێك لەپێغەمبەر زادەکان بەناوی دەبورا ئەوانی رزگار کرد و پیاوێك بەناوی بارق بۆ چوار ساڵ لەلایەن ئەو ژنەوە فەرمانرەوایەتی کرد.
ئەوسا خەڵکانێك لەبنەماڵەی لوت بەسەریاندا زاڵ بوون و حەوت ساڵ فەرمانرەوایەتیان کرد. لەکۆتاییدا پیاوێك بەناوی جەدعون کوڕی یواش لەمناڵەکانی نفتالی کوڕی یەعقوب ئەوانی رزگار کرد و بۆ ماوەی چل ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. دوای ئەو کورەکەی بەناوی سەدمالخ سێ ساڵ سەرقاڵی رێکخستنی کاروباری ئەوان بوو. دوای ئەو فولەع کوڕی فوا کورە خاڵی سەدمالخ (یا کورە مامی) بیست و سێ ساڵ و ئەوسا پیاوێك بەناوی یائیر بۆ بیست و دوو ساڵ فەرمانرەوایەتی ئەوانی کرد.

ئەوسا خەڵکانێك لەکوڕی عمون لەفەلستینییەکان بۆ هەژدە ساڵ بەسەریاندا زاڵ بوون و دواتر پیاوێك بەناوی یفتەح بۆ شەش ساڵ، دوای ئەو یەبحسون حەوت ساڵ، ئالون دە ساڵ و دواتر لترون (و بە وتەی هەندێ کەس عکرون) هەشت ساڵ بەهەڵسوڕاندنی کاروباری ئەوان سەرقاڵ بوو. دواتر فەلەستینییەکان بەسەریاندا زاڵ

بوون و چل ساڵ فەرمانڕەوایەتیان کرد. دوای ئەوە شەمسون بۆ ماوەی بیست ساڵ هاتە سەر تەخت و دوای ئەمانە بۆ ماوەی دە ساڵ یا بیست ساڵ بێ سەرپەرەست مانەوە و دواتر کاهینێك بەناوی عالی گەشتە فەرمانرەوایەتی. لەرۆژگاری ئەودا بەوتەی هەندێ کەس، خەڵکی فەلەستین دەستیان بەسەر تابووتەکەدا گرت. کاتێك لەرۆژگاری پاشایەتی ئەو چل ساڵ گوزەرا، ئەشمویل بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا و بۆ ماوەی بیست ساڵ کاروباری ئەوانی رێکخست و ئەوسا منداڵەکانی، منداڵەکانی ئیسرائیل داوایان لێکرد بۆ ئەوان پاشایەك دیاری بکات تا بەرێبەرایەتی ئەو لەگەڵ دوژمنەکاندا بجەنگن.

## داستانی ئەشمویل و تالوت

بەسەرهاتی ئەشمویل کوڕی بالی بەمشێوەیە: کاتێك گرفتاری منالەکانی، منالەکانی ئیسرائیل درێژەی کێشا و دوژمنان چاوی تەماحیان لەولاتەکەیان بڕیبوو و کاریان گەشتە ئەوەی جالوت پاشای کەنعانییەکان مەبەستی داگیر کردنی ولاتەکەیانی کرد (ئەو لەمیسر تا فەلەستینی لەژێردەستدا بوو). بەسەر ئەواندا زاڵ بوو و باجی لەسەردانان و تەوراتی لەچنگ دەرهێنان، داویان لەخوا کرد پاشایەکیان بۆ هەڵبژێرێت تا بەهاوکاری ئەو لەگەڵ دوژمناندا شەڕ بکەن. منالّ زادەکانی پێغەمبەرەکان لەناو چبوون و کەس جگە لەژنێکی دووگیان لەناویاندا نەمابوو. ئەویان لەماڵێکدا زیندانی کرد نەکا کچی ببێت و لەگەڵ کوڕێکدا ئالوگۆڕی بکات چوونکە ژنەکە دەیزانی منالەکانی ئیسرائیل خوازیاری منالەکەی ئەون. ئەو کوڕێکی هێنایە دنیا و ناویان نا ئەشمویل. ماناکەی بەعیبری ئەمەیە (خوا دۆعاکەی منی بیست).

هۆکاری ئەم ناولێنانە ئەمە بوو: ئەو ژنێکی نەزۆك بوو و مێردەکەی ژنێکیتری کردە هاوسەر کە دە منالی هێنایە دنیا. ئەو ژنە شانازی بەمنالە زۆرەکانی خۆی دەکرد و ئەوی ئازاردەدا. پیرێژن دڵیشکا و لەخواپارایەوە کوڕێکی پێببەخشێت. خوا بەزەیی پیایدا هاتەوە. ئەو لەهەمان کات گرفتاری خوێنبەربوونی مانگانەبوو (کاتێك پاك بوویەوە) مێردەکەی لەگەڵی خەوت و دووگیانی کرد. کاتێك ڕۆژگاری دووگیانی ئەو کۆتایی پێدەهات، کوڕەکە چاوی بەدنیا هەڵهێناو ناویان نا ئەشمویل. کاتێك گەورە بوو ڕەوانەی بیت المقدسی کرد. تەورات فێربوو و پیرەپیاوێك لەزاناکانی ئەوان، بەکوری خۆی بانگی دەکرد و سەرپەرەستی گرتە ئەستۆ.

کاتێك ڕۆژگاری ئەوە هات خوا بۆ پێغەمبەری هەڵیبژێرێت، جبرەئیل هاتە لای ( ئەو لەنوێژدابوو). ئەوی بەدەنگێك هاوشێوەی دەنگی پیرەپیاوی زانا بانگ کرد. ئەشمویل ڕۆشتە لای پیرەپیاو و وتی: چیت دەوێت؟ پیرەپیاو نەیویست بڵێت بانگی تۆم نەکردووە چوونکە دەترسا ئەو لەو دەنگە بترسێت. لەبەر ئەمە وتی: بگەڕێرەوە و بخەوە. گەڕایەوە و جبرەئیل جارێکیتر هات و بانگی کرد. هاتە لای پیرەپیاوی زانا و

پیرەپیاو وتی: کوڕم بگەڕێوە و ئەگەر بانگی تۆم کرد وەڵام مەدەرەوە. جاری سێیەم، جبرەئیل خۆی ئاشکرا کرد و فەرمانی پێدا موژدەدەر و ئاگادار کەرەوەی ئەتەوەکەی خۆی بێت. جبرەئیل پێی وت خوا بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵیبژاردووە. ئەو خەڵکی بۆ خواپەرەستی هاندەدا بەڵام بەدرۆزن لەقەڵەمیاندا و دواتر فەرمانبرداری بوون و بۆ ماوەی بیست ساڵ (و بەوەتەی هەندێ کەس چل ساڵ) سەرقاڵی ڕێکخستنی کاروباری ئەوان بوو.

عیملاقان بەسەرکردایەتی پاشاکەیان جالوت، بەتەواوی منداڵەکانی ئیسرائیلیان سەرکوت کرد و ئازاریاندان بەشێوەیەك مەبەستی ئەوەیان کرد بەتەواوی لەناویان ببەن. کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل ئەمەیان بینی، بەپێغەمبەرێك لەپێغەمبەرەکانی خۆیان وت: بۆ ئێمە پاشایەك دیاری بکە تا بەهاوکاری ئەو لەڕێگای خوادا شەر بکەین. پێغەمبەر وتی: ئایا دەتوانرێت ئەگەر شەڕتان لەسەر بنووسن و فەرمانی شەڕ بەئێوە بدەم، خۆی لێ دوور بخەنەوە و شەڕنەکەن؟ وتیان: بۆ شەڕنەکەین لەکاتێکدا ئێمەیان لەماڵەکانمان دەرپەڕاندووە و لەکوڕەکانمان جیایان کردووینەتەوە. بەڵام کاتێك شەڕ دەستی پێکرد جگە لەژمارەیەکی کەمیان زۆرینەیان لەشەڕ کردن خۆیان بەدوور گرت و خوا لەکاری ستەمکاران ئاگادارە (بقرە/٢/٢٤٦).

ئەو لەخوا پاڕایەوە و خوا داردەست و شاخێکی نارد کەڕۆنی تیا بوو. بەپێغەمبەر وترا: پاشایەك کەخوا دیاری دەکات دەبێت کەسێك بێت بەرزی باڵای بەقەدەر ئەم داردەستە بێت. وئەگەر کەسێك هاتە لای تۆ و ڕۆنێك کەلەم شاخەدایە بکوڵێت یا بێتەدەر، ئەو کەسە پاشای منداڵەکانی ئیسرائیلە. سەری بەم ڕۆنە چەور بکە و وەك پاشا دیاری بکە. منداڵەکانی، منداڵەکانی ئیسرائیل خۆیان بەداردەستەکە پێوا بەڵام ئەندازەی هیچ کامیان نەبوو. تالوت پیاوێکی پێستەچی بوو. دەستەیەك دەڵێن سەقاو بوو، ئاوی دەردەهێنا و دەیفرۆشت. لەوکاتەدا کەرەکەی تالوت ون بوو، ئەو بەدوایدا دەگەڕا. کاتێك لەو شوێنەی تێپەری ئەشمویلی لێبوو، هاتە لای تا داوای لێبکات لەخوا بپارێتەوە بۆ ئەوەی کەرەکەی بدۆزێتەوە. کە هاتە لای ڕۆنەکە کوڵا یا هاتەدەر و کاتێك ئەویان بەداردەستەکە پێوانە کرد، ئەندازەی خۆی بوو. پێغەمبەر وتی: خوا تالوتی بۆ پاشایەتی هەڵبژاردووە (بقرە/٢/٢٤٧). ناوی ئەو بەسریانی شاول

کوڕی قەیس کوڕی ئەنمار کوڕی زەرار کوڕی یەحرەف کوڕی یەفتەح کوڕی ئەیش کوڕی بنیامین کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم بوو. مناڵەکانی ئیسرائیل بەپێغەمبەرەکەی خۆیان وت: هیچکات بەم ئەندازەیە درۆزن نەبوویت. ئێمە لەبنەماڵەی پاشاکانین و تالوت سامان و هێزی نییە تا شوێنکەوتە و ملکەچی فەرمانەکانی بین.

ئەشمویل وتی: خوا ئەوی بۆ ئێوە دیاری کردووە و زانستی پێ بەخشیوە ( و هەم زانایە و هەم بەهێز) خوا پاشایەتی خۆی بەو کەسە دەدات خۆی بخوازێت و خوا دەست کراوە و زانایە(بقرە/٢/٢٤٧). منالەکانی ئسرائیل وتیان: ئەگەر راست دەکەیت، نیشانەیەك لەخواوە بهێنە. پێغەمبەر وتی: نیشانەی پاشایەتی ئەو ئەمەیە: تابوتێك بەسەرتانا دادەبارێت کەتیایدا ئارامشێك لەخواکەتانە و پاشماوەیەك لەوەی بنەماڵەی موسا و بنەماڵەی هارون بەجێیان هێشت و فریشتەکان هەڵیدەگرن و دەیهێنن و ئەمە خۆی نیشانەیەکی ڕوونە ئەگەر لەباوەڕدارانن (بقرە/٢/٢٤٨). ئارامی سەری پشیلەیەك بوو و هەندێ دەڵێن تەشتێکی زێرین کەدڵی پێغەمبەرانیان تیا دەشۆرد. شتی جیاواز لەمەیش وتراوە. لەتابووتەکە تەختەی تیا بوو لەیاقوت و گەوهەر و زێر.

پاشماوەکە، داردەستەکەی موسا و دەستەیەك لەتەختەکەکانی (لەوحەکانی) ئەو بوو. فریشتەکان تابووتەکەیان هێنا و لەرۆژی روناك لەنێوان زەمین و ئاسمان دایان بەتالوت و خەڵك سەیریان دەکرد. تالوت تابووتەکەی بۆ هێنان. ئەوان بەتوڕەییەوە بەپاشایەتیەکەی رازی بوون و ئەخوازراو لەگەڵ ئەودا بۆ شەڕ رۆشتن. ئیسرائیلیەکان هەشتا هەزار کەس بوون. کاتێك تالوت لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و گەشتنە هامون، تالوت پێی وتن: خوا ئێوە بەجۆگەلەیەك تاقی دەکاتەوە. هەر کەس لێی بخوات لەمن نییە و هەر کەس لێی نەخوات لەمنە مەگەر ئەوەی بەدەستی خۆی یەك مشت ئاو هەڵبگرێت (بقرە/٢/٢٤٩). ئەمە هەمان روباری فەلەستین یا روباری ئەردەنە کەهەموویان لێیان خواردەوە مەگەر کەمێك لەوان کەژمارەیان چوار هەزار کەس بوو. هەر کەس خواردی تینویەتی یەخەی گرت و هەر کەس یەك مشت زیاتری نەخوارد تێراو بوو. کاتێك تالوت و شوێن کەوتوانی لەو روبارە تێپەرین،

چاویان بەجالوت کەوت. ئەو زۆر بەهێز بوو. کاتێك منالەکانی ئیسرائیل بینیان زۆربەیان گەڕانەوە و وتیان: ئێمە ئەمڕۆ توانای شەڕ کردن لەگەڵ جالوت و سوپاکەی ئەومان نییە. ئەو لەگەڵ ٣١٣ کەس مانەوە و ئەوان بەژمارەی هاوڕێیانی پێغەمبەری ئیسلام لەشەڕی بەدر بوون. کاتێك سست باوەڕان گەڕانەوە، ئەوانەی بێ گومان دەیانزانی چاویان بەخوا دەکەوێت، وتیان: چەندە زۆربوون سوپای کەم کەتوانیویانە بەسەر سوپای زۆردا سەرکەون و خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە(بقره/٢/٢٤١).

لەناو ئەواندا ئەیشی باوکی داوود و سیانزە کورەکەی بوون. داوود کورە بچوکی بوو. ئەو بەدوای باوکیدا دەڕۆشت و مەڕی بۆ دەلەوەڕاند و خواردنی دەهێنا. ڕۆژێك بەباوکی وتبوو: ئەی باوکە، بەم قۆچەقانییەی خۆم هیچم نیشانە نەگرتووە مەگەر ئەوەی لەپێی بخەم. دواتر وتبووی: ڕۆژێك لەکوێستان بووم و شێرێکی خەوتووم بینی، سواری بووم و دو گوێچکەیم گرت و لێی نەترسام. ڕۆژێکیتر هاتە لای و وتی: لەکوێستاندا دەڕۆم و سپاسی خوا دەکەم و هیچ کێوێك نامێنێتەوە مەگەر ئەوەی لەگەڵ من سپاسی خوا بکات. باوك وتی: پیرۆزت بێت ئەمە موژدەیەکە خوا بەتۆی بەخشیوە.

خوا بۆ ئەو پێغەمبەرەی لەگەڵ تالوت بوو، شاخێك کەڕۆنی تیا بوو، هاورێ لەگەڵ تەنورێکی ئاسنینی نارد و پێغەمبەر بۆ تالوتی نارد و وتی: شەڕکەرێك لەنێوە کەجالوت دەکوژێت، ئەم ڕۆنە دەخاتە سەر و ڕۆنەکە دەکوڵێت تا لەشاخەکەوە دێتەدەر بەڵام لەسەری بەرەو ڕوخساری نایەت و ئەم شاخە وەك تاجێك لەسەریدا دەمێنێتەوە. ئەم شەڕکەرە دەڕواتە ناو ئەم تەنورە و پڕی دەکات. تالوت ئیسرائیلیەکانی یەك یەك بانگ کرد بەڵام ئەم نیشانانە لەگەڵ هیچ کامدا یەکی نەدەگرتەوە. ئەوسا داوودی لەشوانییەوە بانگ کرد. داوود لەسەر ڕێگای خۆی سێ بەردی هەڵگرت، قسەیان لەگەڵدا کرد و وتیان: ئەی داوود ئێمە هەڵگرە چوونکە جالوت بەئێمە دەکوژیت. داوود ئەوانی هەڵگرت و خستییە ناو تورەکەکەی. تالوت وتبووی: هەر کەس جالوت بکوژێت کچەکەم دەکەمە هاوسەری و مۆر و فەرمانی ئەو لەوڵاتدا بڵاو دەکەمەوە.

کاتێك داوود گەشت، شاخەکەیان خستە سەرسەری و ڕۆن کوڵا وسەری چەور بوو.

ڕۆشتە ناو تەنورەکە و پڕی کرد. داوود لاوێکی لاغر، چاوسەوز و زەرد ڕەنگ بوو. کاتێك ڕۆشتە ناو تەنورەکە تیایدا گیری کرد، ئەندازەی بوو. ئەشمویل و تالوت و منالەکانی ئیسرائیل پێی شادمان بوون و ڕوویان کردە جالوت و بۆ شەڕ ڕیزیان بەست.

داوود بۆ شەر لەگەڵ جالوت لەناو سوپا هاتەدەر. بەردەکانی هەڵگرت و یەك یەك دەیخستە ناو قۆچەقانییەکەی. یەکێك لەوانی بۆ جالوت هاویشت، سەری شکا و کوژرا. ئەو بەردانە بەرهەر کەس دەکەوت دەیکوشت و لەو تێپەر دەبوو و دەگەشتە کەسانیتر و ئەوانیشی لەپێ دەخست. دواتر جالوت بەیارمەتی خوا تێکشکا و تالوت گەڕایەوە و کچەکەی کردە هاوسەری و مۆر و فەرمانەکانی لەوڵاتدا بڵاو کردەوە. خەڵك دڵیان پێبەست و شوێنی کەوتن.

لەم کاتەدا ئاگری ڕژدی تالوت بۆ سەر داوود کوڵهات و ویستی بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژێت. داوود بەمەی زانی و لێی جیابوویەوە. مەشکەیەکی پڕ مەی لەجێگاکەی خۆیدا دانا و دایپۆشی. تالوت هاتە شوێن خەوەکەی ( داوود ڕایکردبوو) بەشمشێر لەمەشکەکەیدا، دڕاندنی و چەند دڵۆپێك مەی کەوتە ناودەمی. تالوت وتی: خوا لەداوود خۆش بێت چ مەیخۆرێکی زۆرخۆر بوو! کاتێك بەیانی هات، تالوت زانی هیچی نەکردووە و ترسا داوود بکوژێت و لەبەر ئەمە پاسەوان و دەرگاوانەکانی خۆی زیاد کرد.

داوود هاتە ماڵی تالوت و بینی خەوتووە. دو تیری لای سەر و قاچەکانی دانا و ڕۆشت. کاتێك تالوت بەئاگا هاتەوە و تیرەکانی بینی، وتی: خوا لەداوود خۆشبێت! ئەو لەمن باشترە، من ڕۆشتمە سەر سەری ویستم بیکوژم بەڵام ئەو هاتە سەر سەری من و هیچی نەکرد. ئەو کەس و سیخوری بۆ دۆزینەوەی داوود دانا بەڵام نەیاندۆزییەوە.

ڕۆژێك تالوت سوار بوو، داوودی بینی و شوێنی کەوت بەڵام داوود ڕایکرد و لەئەشکەوتێك لەکوێستان خۆی داشارد و خوا شوێنپێکانی لەبەرچاوی تالوت پاك کردەوە. تالوت هەموو زاناکانی کوشت بەشێوەیەك جگە لەژنێك کەس نەمایەوە. ئەم ژنە گەورەترین ناوی خوای دەزانی. تالوت فەرمانی بەپیاوێك کرد بیکوژێت بەڵام ئەو پیاوە بەزەیی پیایدا هاتەوە و بەرەڵای کرد و بە نهێنی ڕوداوەکەی هێشتەوە.

تالوت لەوەی کردبووی پەشیمان بوویەوە و بڕیاری دا بۆ لای خوا بگەڕێتەوە. دەستی بەگریان کرد بەرادەیەك دڵی خەڵك بۆی سوتا. شەوانە لەماڵ دەهاتە دەر و دەڕۆشتە گۆرستان و دەگریا و دەیوت: هەر بەندەیەك ڕێگای گەڕانەوەی من بۆ لای خوا بزانێت، سوێند دەدەم منی لێ ئاگادار بکات. کاتێك ئەم کارەی زۆر دوبارە کردەوە، ئاوازدەرێك لەگۆرستان بانگی کرد و وتی: ئەی تالوت بەوە شادمان نەبوویت ئێمەت کوشت و ئێستا لەگۆری مردندا ئازارمان دەدەیت! لەبەر ئەمە خەم و گریانی ئەو زیادی کرد. ئەو پیاوە فەرمانی کوشتنی ژنەکەی پێ سپێردرا بوو، دڵی بۆی سوتا و وتی: ئەگەر تۆ بۆ لای زانایەك ڕێنوێنی بکەم، دەیکوژیت؟ وتی: نە. پیاوەکە لەتالوت سوێند و پەیمانی وەرگرت و دواتر ئەوی لەڕوداوی ژنەکە ئاگادار کردەوە. تالوت وتی: لەو ژنە بپرسە ئایا ڕێگایەك بۆ گەڕانەوەی من بۆ لای خوا هەیە. پیاوەکە هاتەلای ژنەکە وتی: ئایا تالوت ڕێگای گەڕانەوەی بۆ لای خوا هەیە یانە؟ ژن وتی: بۆ ئەو ڕێگایەك نابینم. بەلأم ئایا ئارامگای پێغەمبەرێك دەناسن؟ وتیان: بەڵێ، ئارامگای کوڕی یوشەع. ژن بەرێکەوت و خەڵك لەگەڵی بەرێکەوتن. ژن بانگی کرد و یوشەع کوڕی نون هاتەدەر و کاتێك ئەوانی بینی، پرسی: چیتان دەوێت؟ وتیان: هاتووین بپرسین ئایا ڕێگایەك بۆ گەڕانەوەی تالوت بۆ لای خوا هەیە. وتی: ڕێگایەك نابینم مەگەر ئەوەی لەتەختی پاشایەتی بێتە خوار و خۆی و کوڕەکانی بۆ شەڕ لەڕێگای خوا بڕۆنەدەر و سەرەتا منداڵەکانی شەڕ بکەن تا بکوژرێن و دواتر خۆی شەڕ بکات تا لەناو خوێن و خۆڵدا بتلێت. ئەگەری هەیە لێرەوە ڕێگای گەڕانەوەی ئەو بۆ لای خوا بکرێتەوە. یوشەع ئەم قسانەی کرد و کەوتە سەر زەوی و مرد. تالوت خەمبارتر لەوەی بوو گەڕایەوە چوونکە دەترسا منداڵەکانی فەرمانی جێبەجێ نەکەن. ئەوەندە گریابوو پێلوەکانی ڕزان و جەستەی لاواز و بێهێز بوو. کوڕەکانی لەحاڵیان پرسی و ئەو بەسەرهاتەکەی گێرایەوە. ئەوان ئامادەی شەڕکردن لەڕێگای خوادا بوون و لەبەرچاوی ئەو شەڕیان کرد تا کوژران. دواتر خۆی شەڕی کرد تا کوژرا.

دەستەیەك دەڵێن ئەو پێغەمبەرەی بۆ تالوت نێردرا و ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ لای خوای نیشاندا، ئەلیەسع بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەشمویل بوو. و خوا زاناترە.

ڕۆژگاری پاشایەتی تالوت تا ئەو کاتەی لەڕێگای خوادا کوژرا، چل ساڵ درێژەی کێشا.

## داستانی پاشایەتی داوود

نەژادنامەی ئەو بەم شێوەیە: داوود کوڕی ئەیش کوڕی عوەید کوڕی باعز کوڕی سەلمون کوڕی نەحشون کوڕی عەمی کوڕی نوزەی کوڕی رام کوڕی حەسرون کوڕی فارز کوڕی یەخوزا کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم. پیاوێکی کورتەبالاً و چاو سەوز و کەم مو بوو. کاتێك تالوت کوژرا، منداڵەکانی ئیسرائیل هاتنە لای داوود و هەموو گەنجینەکانی تالوتیان پێدا و ئەویان کردە پاشای خۆیان. دەستەیەك دەڵێن: داوود پێش کوژرانی جالوت گەشتە پاشایەتی و هۆکاری پاشایەتییەکەی لەم کاتەدا ئەوە بوو خوا فەرمانی بەئەشمویلدا فەرمانی هێرش کردنە سەرشاری مەدیەن و کوشتنی خەڵکەکەی بدات. ئەو رۆشت و هەموو خەڵکی ئەوشارەی جگە لەپاشاکەیان کوشت و ئەوی بەدیلی گرت. خوا وەحی بۆ ئەشمویل نارد: بەتالوت بڵێ: تۆم بەکارێك فەرماندا بەکۆتاییت نەگەیاند (بۆ تەنیا ئەم یەك کەسەت نەکوشت؟). بێ گومان پاشایەتی لەتۆ و منداڵەکانت دەستێنمەوە و تا رۆژی کۆتایی دەستان ناکەوێتەوە. خوا فەرمانی بەئەشمویل دا داوود بکاتە پاشا. ئەو داوودی کردە پاشا و داوود بۆ شەڕ لەگەڵ جالوت بەرێکەوت و ئەوی کوشت. و خوا زاناترە.

کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، خوا هەم کردییە پاشا و هەم پێغەمبەر. زەبووری بۆ نارد و دروست کردنی زرێی فێر کرد. یەکەم کەس بوو زرێی دروست کرد. خوا باڵندە وکێوەکانی فەرموو کاتێك سپاسی خوادەکەن لەگەڵ ئەودا ئەم کارە بکەن. خوا بەکەسێك ئاوازێکی خۆشتر و دڵگیتر لەداوودی نەبەخشیوە. کاتێك زەبووری دەخوێند، ئاژەڵە کێوی و دەشتییەکان لێی نزیك دەبوونەوە و گوێیان لێدەگرت بەشێوەیەك ملی ئەوانی دەگرت.

پیاوێکی تێکۆشەر بوو و زۆر پەرەستشی خوای دەکرد و زۆر دەگریا. شەو بۆ نوێژ کردن دەوەستا و نیوەی ساڵ بەرۆژو بوو. چوار هەزار کەس بەشێوەی شەوانە رۆژی پاسەوانیان دەکرد. لەدەسترەنجی خۆی دەخوارد ( و مانگانەی ئەو چوار هەزار کەسەیش لەخواردن و جل و بەرگ و کەرەستەی نیزامی و کرێ خانوی ئەو سوپا گەورەیە لەکار و رەنجی خۆی دەدا).

لەرۆژگاری ئەودا دانیشتوانی شاری ئەیلە لەروخساری مرۆڤ دەرچوون و بوونە هاوشێوەی مەیمون. هۆکاری ئەم کارە ئەوەبوو: رۆژانی شەممە ماسی زۆریان بەدەست دەگەشت و کاتێك رۆژەکانیتر دەبوو هیچیان دەست نەدەکەوت. ئەوان لەنزیك دەریا ناوگیری گەورەیان دروست کرد و ئاویان تێکرد. کاتێك کۆتایی رۆژی هەینی دەگەشت، ئاویان بۆ ناو ناوگیرەکان دەکردەوە و ماسییەکان دەرۆشتنە ناوی. ئەوان رۆژانی یەکشەممە ماسیان دەگرت. دەستەیەك لەدانیشتوانی شار رێگەی ئەم کارەیان لێگرتن بەلاّم دەستیان لەم کارە هەڵنەدەگرت و لەبەر ئەمە خوا ئەوانی کردە مەیمون. ئەوان سێ رۆژ مانەوە و دواتر مردن.

## داستانی دڵدانی داوود بۆ ژنەکەی ئەوریا

خواوەند داوودی گرفتاری ژنەکەی ئەوریا کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەمە بوو: داوود زەمانی خۆی بۆ سێ بەش دابەش کرد: رۆژێك بۆ داوەری لەنێوان خەڵك دادەنیشت، رۆژێك کاری پەرستنی خوای ئەنجام دەدا و رۆژێکی لەگەڵ ژنەکانی بەخۆشی دەبردە سەر. ئەوەد و نۆ ژنی بوو. رۆژێك رویکردە خوا و وتی: خواوەندا دەبینم هەموو باشییەکان باوکەکانم لەگەڵ خۆیاندا بردوویانە. بەمنیش چاکە و باشەی هاوشێوەی ئەوان ببەخشە. خوا وەحی پێکرد: باو و باپیرانی تۆ گۆفتاری تاقی کردنەوە بوون و خۆراگریان کرد. ئیبراهیم فەرمانی سەربرینی کورەکەی پێدرا، ئیسحاق کوێربوو و یەعقوب بەتاقی کردنەوەی دووری و جیایی لەکورەکەی گرفتار بوو. داوود وتی: خوایە منیش وەك ئەوان تاقی بکەرەوە و لەوەی بەوانت بەخشی بەمنیشی ببەخشە. خوا وەحی پێکرد: تاقیت دەکەینەوە، ئاگادار بە.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری تاقی کردنەوەی ئەوەبوو لەگەڵ خۆیدا پەیمانی بەست رۆژێك بێ ئەنجامدانی کاری خراپە بەسەرببات. کاتێك ئەو رۆژەهات کەتەنیا کاری پەرستنی ئەنجام دەدا، ویستی پەیمانەکەیشی جێبەجێ بکات. لەبەر ئەمە دەرگای داخست و دەستی بەپەرستنی خوا کرد. لەناکاو کۆترێکی زێرین لای نیشتەوە

کەهەموو رەنگە جوانەکانی لەگەڵدا بوو. مەبەستی گرتنی کۆترەکەی کرد. کۆترەکە کەمێك دوور کەوتەوە بێ ئەوەی ئەو لەگرتنی خۆی بێ هیوا بکات. ئەو دەرۆشت و ئەمیش شوێنی دەکەوت. لەم کاتەدا داوود چاوی بەژنێك کەوت. جەستەی سپی و پەیکەری سیمینی خۆی دەشۆرد. کاتێك ئەو ژنە سێبەری داوودی بینی، قژە درێژەکانی بلاو کردەوە و خۆی پێ داپۆشی. ئەم کارە زیاتر بووە هۆی عاشق بوونی داوود. ویستی ئەو ژنە بناسێت. ئاگاداریان کردەوە کەهاوسەرەکەی لەفلان سنور پاسەوانی ولاتەکەی تۆ دەکات. داوود بۆ فەرماندەی پاسەوانانی سنوور پەیامی نارد: ئەوریا — هاوسەری ئەو ژنە — بۆ شەڕ لەبەرامبەر تابووت بنێرێت. ئایین بەمشێوە بوو هەر کەس لەبەرابەر تابووت شەری دەکرد، شکەستی نەدەخوارد، یا سەردەکەوت، یا دەکوژرا. فەرماندە ئەم کارەی کرد و ئەو کوژرا.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك داوود لەو ژنەی ڕوانی و شەیدای بوو، لەهاوسەرەکەی پرسی کەوتیان: لەفلان سوپادایە. داوود بۆ فەرماندەی ئەو سوپایە پەیامی نارد: هاوسەری ئەو ژنە ڕەوانەی فلان شەڕ بکات. هاوسەر رۆشت و تەندروست گەرایەوە و خوا سەرکەوتنی بەو بەخشی. دووبارە داوود فەرمانیدا بۆ شەڕی فلان دوژمنیتر کەبەهێزتر بوو، بنێردرێت. ئەو رۆشت و سەرکەوتوو گەرایەوە. داوود فەرمانیدا و ئەویان روبەروی سێیەم دوژمن کردەوە.ئەوریا رۆشت و کوژرا و داوود ژنەکەی کردە هاوسەری خۆی و ئەم ژنە بەوتەی قتادە ژنی سلێمان بوو.

دەستەیەکیتر دەڵێن: گوناحەکەی داوود بەم شێوەبوو: کاتێك ناوبانگی جوانی ژنی ئەوریای بیست، ئارەزوی کرد رۆژێك ئەو رۆژییە ببێتە حەلالی. وای لێهات ئەوریا رۆشتە شەڕ لەپێناو خوا کوژرا و داوود ئەوەندەی بۆ بەداخ بوو کەبۆ هیچ کەسیتر نەبوو. رۆژێك کەداوود لەمیحرابی نوێژدا بوو (ئەمە رۆژی پەرستنی ئەو بوو و دەرگای دادەخست)، دوو فریشتە هاتن. خوا ئەوانی ناردبوو. ئەوان لەدرگای داخراو هاتنەناو و داوود ترسا.

خوا ئەم داستانەی بەمشێوە لە قورئاندا باس کردووە: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئایا داستانی دوو دوژمنت بیستووە؟ ئەوسا کە لەدیواری کۆشك هاتنەسەر و رۆشتنە ژوور. هاتنە لای داوود و داوود لەوان ترسا. وتیان: مەترسە، دوو دوژمنین، یەکمان

ستەمی لەویتیرمان کردووە. لەنێوان ئێمە بەراستی داوەری بکە و لەرادە تێمەپەرە و ئێمە بۆ رێگای راست رێنوێی بکە. ئەمە برای منە، نەوەد و نۆ گامێشی هەیە بەلام من تەنیا یەك گامێشم هەیە. دەڵێت: ئەو یەك دانەیش بدە بەمن. ئەو منی لەگفتوگۆدا بەزمان چەوری هەڵخەڵەتاند. داوود وتی: ستەمی لە تۆکرد کەئەو یەك گامێشەی داوا کرد و زۆربەی شەریکەکان و هاوکاران لەیەکتر زیاتر دەخوازن مەگەر ئەوانەی باوەڕیان هێنا و چاکەیان کرد و ئەمانە زۆر کەمن. داوود بەراستی زانی تاقیمان کردەوە. کەوتە سەر زەوی و نوێژی خوێند و داوای لێبووردنی کرد و بە دڵ و گیان بۆ لای ئێمە گەرایەوە.

ئەوەی وتی: منی بەزمان چەوری هەڵخەڵەتاند یانی سەرکەوتی کردم و گامێشەکەی لێ سەندم. داوود لەوەی تری پرسی: چی دەڵێت؟ وتی: براکەم راست دەکات، ویستم ژمارەی گامێشەکانم بگەینمە سەد و تەواو بن ولەبەر ئەمە گامێشەکەیم لێسەند. داوود وتی: رێگە نادەین ئەم کارە بکەیت. فریشتە وتی: تۆ هێزی ئەوەت نییە. داوود وتی: ئەگەر گامێشەکەی بۆ نەگەرێنیتەوە ئەمە و ئەمە لەتۆ دەقرتێنین( و لوت و ناوچاوانی خۆی نیشاندا). فریشتە وتی: ئەی داوود ، تۆ شیاوتری لوت و ناوچاوانت لەزەوی بدەن چوونکە تۆ نەوەد و نۆ ژنت هەیە و ئەوریا تەنیا یەك ژنی بوو. تۆ بەردەوام بە فێل و فریو هەڵتخەڵەتاند وئەوت بەکوشتدا و ژنەکەی ئەوت کردە هاوسەری خۆت. فریشتە ئەمەی وت و لەبەرچاو ونبوو.

داوود زانی چۆن گرفتاری تاقی کردنەوە بووە. کەوتە سەر زەوی و سەری خستە سەر خاك و ناوچاوی لەزەویدا و جگە بۆ کارێکی پێویست هەڵنەیەگرت. بەردەوام دەگریا تا لەفرمێسکی ئەو گیایەك ڕوا و سەری داپۆشی. دواتر هاواری کرد: خواوەندا، ناوچاوم بریندار بوو، چاو وشکی کرد بەلام داوود بۆ گوناحەکەی خۆی ولامی نەبیست. پێیان وت: ئایا برسیتە تا تێر بکرێیت یا نەخۆشی تاچاك بکرێیتەوە یا ستەمت لێکراوە کە خوازیاری ماف سەندنەوە و دادپەروەریت؟ دەڵێت: داوود بەشێوەیەکی ئەوتۆ گریا ئەوەی ڕوا بوو، ئاگری گرت. لەمکاتەدا خوا گەڕانەوەی ئەوەی لەگوناح وەرگرت و وەحی پێکرد: سەرت بەرز بکەرەوە لەتۆ خۆش بووین. داوود وتی: خواوەندا، چۆن بزانم لەمن خۆش بوویت؟ تۆ داوەرێکی دادپەروەریت کە

لەفەرماندان و داوەری کردن ستەم ناکەیت. ئەگەری هەیە ڕۆژی کۆتایی ئەوریا بێت و سەری بگرێتە دەستی ڕاست ولەدەمارەکانی ملی خوێن ببارێت و ئەوسا لەبەردەم عەرشی تۆدا بێستێت و بڵێت: خوایە لەم پیاوە بپرسە منی بەتاوانی کام گوناحە کوشت. خوا وەحی پێکرد: ئەگەر ئەوریا ئەم کارە بکات، بانگی دەکەم و داوای لێخۆشبوونی تۆی لێدەکەم ومن بەهەشت بەو دەبەخشم. داوود وتی: خواوەندا ئێستا زانیم منت بەخشیوە.

دەڵێت: دوای ئەوە داوود نەیتوانی چاو لەئاسمان تێر بکات (ماوەیەکی درێژ لەئاسمان بروانێت) ئەمە بۆ شەرم کردن لەخوا بوو. بەم شێوە بوو تا مرد. ئەو گوناحە لەسەر دەستی ئەو نەخشی بەستبوو، کاتێك داوود دەیبینی، دەستی دەلەرزی. بۆ ئەو ئاوییان لەدەفرێك هێنا تا بیخواتەوە. ئەو نیوە یا دوو لەسەر سێی دەخواردەوە و ئەوسا دەکەوتە بیری گوناحەکەی خۆی و لەم کاتەدا بەشێوەیەکی وا دەگریا وەك بڵێی جومگەکانی یەك لەدوای یەك لەیەکدەپچڕێن. دەفرەکەی پڕدەکرد لەفرمێسك. لەو زەمانەدا دەوترا فرمێسکەکانی داوود لەگەڵ فرمێسکی هەموو خەڵك بەرابەری دەکات. ئەو لەڕۆژی کۆتایی دێت و گوناحەکەی لەدەستیدا نوسراوە. دەڵێت: خوایە، گوناحکارم، گوناحکارم، لەپێش کەسانیتر لەکارەکانی من بکۆڵەرەوە. ئەو دەهێننە پێش بەڵام ئارام نابێت و دەڵێت: خوایە من بخەرە دواوە بەڵام بەو شێوەیش ئارام ناگرێت.

گوناحکاری داوود، فەرمانبردنی مناڵەکانی ئیسرائیلی لێسەندەوە و ئەوان بەچاوی سوك سەیریان کرد و یەکێك لەکورەکانی بەناوی ئەیشی کەدایکی کچی تالوت بوو، لێی ڕاپەری و خەڵکی بۆ فەرمانبردن لەخۆی هاندا و شوێنکەوتوانی ئەو لەگومڕاکانی مناڵەکانی ئیسرائیل زیادیان کرد. کاتێك خوا لەداوود خۆشبوو، دەستەیەك لەخەڵك لەدەوری کۆبوونەوە و ئەو لەگەڵ کورەکەی شەڕی کرد و شکستیدا. یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ کوڕەکەی نارد و فەرمانی پێدا لەگەڵ کورەکەی بەنەرمی و لەسەر خۆ هەڵس و کەوت بکات، ئەگەری هەیە گرفتاری بکات و نەیکوژێت. فەرماندە، شوێن کوڕەکەی کەوت. بەرەو دارێك پاشەکشەی پێکرد و کوشتی. داوود لەم کارە خەمبار بوو و لەو فەرماندەیە ڕەنجا و کینەی ئەوی لەدڵ

گرت.

## داستانی دروست کردنی بیت المقدس و مردنی داوود

دەڵێن: لەسەردەمی داوود تاعونێکی سەخت لەناو خەڵکدا بلاو بوویەوە و داوود ئەوانی بۆ شوێنی بیت المقدس برد چوونکە لەوێ فریشتەکانی دەبینی کەبۆ ئاسمان دەرۆن. لەبەر ئەمە نیازی رۆشتن بۆ ئەو سەرزەمینەی کرد تا لەوێ لەخوا بپارێتەوە. کاتێك لەشوێنی تاشەبەرد وەستا، لەخوا پارایەوە رەنجی تاعون لەسەر خەڵك هەڵبگرێت. خوا وەلامی دایەوە و تاعونی لەسەر خەڵك هەلگرت. ئەوان ئەوێیان کردە نوێژگەی خۆیان و مزگەوتێکیان تیا دروست کرد. دەسپێکردنی کاری دروست کردنی لەیانزەهەمین ساڵی پاشایەتی ئەودا بوو. ئەو پێش کۆتایی هاتنی کارەکە مرد و فەرمانی بەسلێماندا ئەو بینا تەواو بکات و ئەو فەرماندەی براکەی ئەیشی کوڕی داوودی کوشتبوو، بکوژێت.

کاتێك داوود مرد و سلێمان ئەوی بەخاك سپارد، روی کردە ئەنجامدانی پێشنیار و داواکارییەکانی باوکی. ئەو فەرماندەی کوشت، بینای مزگەوتەکەی تەواو کرد. بەزێر رازاندییەوە و گەهەری فراوانی تیابەکار برد. هەموو ئەم کارانەی بەهێزی پەری و دێوەکان کرد. کاتێك لەو کارە تەواو بوو، ئەو رۆژەی کردە جەژنێکی گەورە و چەندین قوربانی کرد و خوا لێی وەرگرت. دەسپێکردنی کاری ئەو بەدروست کردنی شاربوو، کاتێك کارەکەی بەئەنجام گەیاند، بەدروست کردنی مزگەوتەکە سەرقاڵ بوو. خەڵك بۆ وەسف کردنی بیناکەی شتی زۆریان وتووە کە لەراستییەوە دوورە وپێویست بەباس کردنیان ناکات.

دەستەیەك دەڵێن: ئەمە سلێمان بوو دەستی بەدروست کردنی مزگەوتەکە کرد. داوود ویستی دروست کردنی دەسپێبکات بەلام خوا وەحی پێکرد و فەرمووی: ئەم ماڵە پیرۆزە و تۆ دەستی خۆت بەخوێنی خەڵك پیس کردووە و شیاونیت بۆ دروست کردنی ئەم بینایە. کورەکەی تۆ سلێمان دروستی دەکات چوونکە دەستی بەخوێنی کەس پیس نەبووە. کاتێك سلێمان پاشایەتی گرتەدەست، دروستی کرد.

داوود مرد. کەنیزێکی بوو شەوانە دەرگاکانی دادەخست و کلیلەکانی دەهێنایە لای و داوود دەستی بە پەرستنی خوا دەکرد. شەوێك دەرگاکانی داخست و پیاوێکی لەناو ماڵەکەدا بینی و لێی پرسی: کێ تۆی هێناوەتە ناو ماڵەکە؟ پیاوەکە وتی: ئەو کەسەم بێ فەرمان دەرۆمە لای پاشاکان. داوود قسەکەی بیست و وتی: ئایا تۆ فریشتەی مەرگیت؟ وتی: بەڵێ. داوود وتی: بۆ کەست بۆ لای من نەنارد تا خۆم ئامادەی مردن بکەم؟ فریشتە وتی: کەسانی زۆرم بۆ لای تۆ نارد. داوود وتی: نێردراوانی تۆ کێ بوون؟ فریشتە وتی: باوك و برا و هاوسێکەت و هاورێکانت بۆ کوێ رۆشتن؟ داوود وتی: هەموویان مردن. فریشتە وتی: ئەوان نێردراوانی من بۆ لای تۆ بوون چوونکە تۆ دەمریت بەو شێوەی ئەوان مردن. فریشتە گیانی گرت. ئەو مرد، سلێمان پاشایەتی و پێغەمبەری و زانستی لەو بەمیرات بۆ مایەوە.

نۆزدە منالی بوو. لەناو ئەوان تەنیا سلێمان جێگەی گرتەوە. تەمەنی داوود لەکاتی مردنی سەد ساڵ بوو. ئەمە بە گێرانەوەیەکی راست لە پێغەمبەر(د.خ) پشت راست کراوەتەوە. سەردەمی پاشایەتی ئەو چل ساڵ درێژەی کێشا.

## پاشایەتی سلێمان کوڕی داوود

کاتێك داوود مرد، دوای ئەو سلێمان بۆ پاشایەتی منداڵەکانی ئیسرائیل دیاری کرا. لەم کاتەدا سیانزەساڵی بوو. خوا پاشایەتی و پێغەمبەری پێبەخشی. داوای لەخوا کرد پاشایەتییەکی وا مەزنی پێببەخشێت دوای ئەو هیچ کەس نەگاتە ئەو پێگەیە. خوا وەڵامی دایەوە و خەڵکان و پەرییەکان و دێوەکان و باڵندەکان و بای کردە فەرمانبرداری ئەو. کاتێك لەماڵ دەهاتەدەر و دەرۆشتە شوێنی دانیشتنی خۆی، باڵندەکان لەسەر سەری سێبەریان دەکرد و خەڵکان وپەرییان لەبەری هەڵدەستان و تا ئەو دانەدەنیشت، هەمووان بەپێوە دەوەستان.

دەستەیەك دەڵێن: دوای ئەوەی پاشایەتی لەدەستی رۆشتەدەر و خوا دووبارە بۆی گەڕاندەوە – بە هەمان شێوە کە ئاماژەی پێدەدەین – با و پەرییەکان و دێو و باڵندەکانی کردە فەرمانبرداری ئەو.

پیاوێکی ئەندام سپی و قەڵەو و توکن بوو، جل وبەرگی سپی دەپۆشی. باوکی لەسەردەمی ژیانی راوێژی لەگەڵ دەکرد و دەگەرایەوە بۆ لای خەڵکەکەی. یەکێك لەوان ئەوەیە کەخوا داستانەکەی لەکتێبەکەیدا باس کردووە و فەرموویەتی: بیربێنەرەوە داستانی سلێمان کوڕی داوود لەوکاتەی لەبارەی ئەو مەزرایە داوەریان دەکرد کەمەڕی خەڵك تیایدا دەلەوەڕان و ئێمە شایەتی داوەری ئەوان بووین (انبیا/٢١/٧٨). داستانەکە بەم شێوە بوو: مەڕی خەڵکانیتر رۆشتنە ناو رەزێك و بۆڵە ترێکانیان خوارد و شێلایان و لەناویان برد. سلێمان یا ئەویتر وتی: ڕەزەکە بسپێرن بەخاوەنی مەڕەکان تا بەچاك کردنەوەی هەستێت و بۆ شێوەی یەکەمی بگەڕێنێتەوە و مەرەکان بدەنە بەخاوەنی ڕەزەکە تا کەڵکیان لێوەربگرێت تا ئەوساتەی ڕەزەکەی چاك دەبێتەوە و ئەوسا ڕەزەکەی وەربگرێتەوە و مەرەکان بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە. داوود داوەریسەکەی ئەوی بەهێز کرد. خوای گەورە فەرموویەتی: تێگەشت داوەریمان بەسلێمان دا و بەهەردووکیان زانایی و فرمزانیمان بەخشی و کێوەکانمان بۆ داوود نەرم کرد بەوشێوەی باڵندە و کێوەکان لەگەڵ ئەودا وەسفی

خوایان دەکرد و ئێمە ئەو کارە دەکەین خۆمان دەمانەوێت (انبیا/٢١/٧٩).

دەستەیەك لەزاناکان دەڵێن: ئەم ئایە نیشانەی ئەوەیە هەر(موجتهید)ێك کە لەحوکمە لاوەکیەکاندا حوکم دەدات، راست کردار بێت چوونکە داوود بەحوکمی راست( کە لەزانستی خوا راست بێت) نەگەشت بەڵام سلێمان بەدەستی هێنا و لەگەڵ ئەمەیشدا خوا فەرمووی: بە هەردووکیان زانست و فرمزانیمان بەخشی.

سلێمان لەدەسترەنجی خۆی رۆژی دەخوارد و شەڕی زۆری دەکرد. کاتێك دەیویست بڕواتە شەر، دەیفەرموو تەختێکی دارین بەئەندازەی هەموو سوپاکەی دورست بکەن تا ئەوان لەگەڵ چوارپێکانی خۆیان سواری بن و ئەوەی پێویستیانە، لەگەڵ خۆیاندا هەڵیبگرن. ئەوسا فەرمانی بەبا دەدا هەڵیانگرێت و لەگەڵ خۆیاندا بیبات. بەرەبەیان رۆشتنی ئەو بایە، یەك مانگ رێگە بوو و شەوانە رۆشتنی یەك مانگ رێگا (سبا/٣٤/١٢). ئەو سێسەد ژن و حەوتسەد کەنیزی بوو (ئەو خواردن و جل و بەرگی و زێر و زیو و ئارایشتی ئەوانی لەدەسترەنجی خۆی دەدا). خوا ئەم پاداشتەی پێدا هەر کەس باسی ئەوی دەکرد، با بەگوێی دەگەیاند و لێی ئاگادار دەبوویەوە.

## داستانی سلێمان و بلقیس

سەرەتا ئەوەی لەبارەی پاشایەتی و نەژادی ئەو ژنە هاتووە، باس دەکەین. زاناکان لەبارەی ناوی باوکی ئەو بەجیاوازی قسەیان کردووە: ئەو بەلقمە کچی لیشرەح (یا ئەنیشرەح) کوڕی حارس کوڕی سەیفی کوڕی سەبا کوڕی یەشجب کوڕی یەعرەب کوڕی قەحتان بوو. دەستەیەك دەڵێن: بەلقمە کچی هادد (یا هودهاد) بوو و ناوی ئەمە لیشرەح کوڕی تەبع زی الازعار کوڕی تەبع زی المنار کوڕی تەبع رایش بوو. لەبارەی نەژادی ئەو شتی تریشیان وتووە کەپێویست بەئاماژەدان ناکات.

خەڵك لەبارەی توبعان (تەبئەبیعە، کۆی توبەع) و لەپێش بوونی دەستەیەك لەوان لەسەر ئەوانیتر و زیاد بوون یا کەم بوونی ژمارەیان بەجیاوازی قسەیان کردووە کەبیسەر سوودێکی لێ بەدەست ناهێنێت. هەروەها لەبارەی نەژادیشیان جیاوازی زۆریان لەبارەوە دروست بووە. زۆربەی ئەوانەی گێراویانەتەوە دەڵێن: دایکی ئەو پەریزادی کچی پاشای پەرییەکان و ناوی ڕواحە کچی سکر بوو. دەستەیەك دەڵێن: ناوی دایکی بەلقمە کچی عەمرۆ کوڕی عەمیری پەریزاد بوو. لەبەر ئەمە باوکی لەگەڵ پەرییەکان پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست چوونکە بەردەوام دەیوت: لەناو خەڵکدا هاوسەرێکم بۆ من بوونی نییە. ئەو خوازبێنی لەپەرییەکان کرد و ئەوان کچێکیان پێدا.

لەبارەی هۆکاری گەشتنی بەپەرییەکان و خوازبێنی ئەو لەوان بەجیاوازی قسەیان کردووە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو شێتی ڕاو بوو. لەبەر ئەمە هەندێکات پەرییەکانی لەروخساری ئاسکدا دەبینی و ڕاوی دەکردن و دواتر( کاتێك دەیبینین پەرین)، ئازادی دەکردن. پاشای پەرییەکان هاتە لای و سپاسی کرد و ئەوی بەهاورێیەتی هەڵبژارد. ئەو خوازبێنی کچی پاشای پەرییەکانی کرد و ئەو کچەکەی خۆی بەو پیاوەدا لەسەر ئەوەی ئەم فەرمانرەوا عەرەبە، پاشایەتی قەراغ دەریا نزیك نێوان بەحرەین یا (شحر) تا عەدەن بەو ببەخشێت. دەستەیەکیتر دەڵێن: ڕۆژێك بۆ ڕاو ڕۆشتەدەر و دوو ماری رەش و سپی بینی کەلێك ئاڵاون و هەر کام هەوڵی دەدا ئەویتر بکوژێت. ڕەشەکە بەسەر سپیەکەدا زاڵ بوو. فەرمانیدا ڕەش مارەکەیان کوشت و سپی

مارەکەی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ ماڵ و ناویان پیاپرژاند. کاتێك مار هاتە هۆش و ئازادی کرد و گەرایەوە بۆ ماڵ و تەنیا دانیشت، لەناکاو بینی لاوێکی جوان لەبەرامبەریدا دانیشتووە. لێی ترسا بەڵام لاوەکە پێی وت: مەترسە، من ئەو ماردم رزگارت کردم و ڕەش مارەکەت کوشت، کۆیلەیەك لەئێمە بوو کە یاخی بوو و ژمارەیەك لەئەندامانی بنەماڵەکەمانی کوشت. پەری جوامێر زانستی پزیشکی و سامانی خستە بەردەمی و وتی: سامانم پێویست نییە و بەڵام پزیشکی بۆ پاشاکان ناشیرینە بەڵام ئەگەر کچێکت هەیە بیکەرە هاوسەری من. ئەو کچێکی پێدا بەو مەرجەی کچەکەی هەر کارێك بکات لێی بەئیراد نەگرێت و هەرکاتێك نیراد بگرێت ژن لێی جیادەبێتەوە و لەبەرچاو ون دەبێت. پاشا بەو مەرجە رازی بوو. ژن دووگیان و کوڕێکی هێنایە دنیا. دایك خستیە ناو ئاگرەوە. ئەو ئارامی لێبرا بەڵام لەسەر مەرجەکەی خۆی مایەوە. دواتر دووگیان و کچێکی هێنایە دنیا، دایك خستیە بەردەم سەگێکی مێ کەهەڵیگرت و رایکرد. ئەم کارەیشی لا گران بوو بەڵام لەسەر مەرجەکەی خۆی مایەوە. دوای ئەوە یەکێك لەهاوڕێکانی یاخی بوو. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و هاوسەرە پەریزادەکەی لەگەڵ خۆی برد. لەرێگادا لەبیابانێکەوە تێپەری و کاتێك گەشتە ناوەراستی بیابان ،بینی هەموو توێشوی خۆی و سوپاکەی پڕبووە لەخاك و خۆڵ و ئاو لەئاودان و مەشکەکان دەرژێتە خوار. هەموویان خوازیاری مەرگی بوون و زانیان ئەمە کاری پەریزادەی هاوسەریەتی. توانای خۆراگری لەبەردەم ئەم کارەی نەبوو، هاتە لای ژنەکە و دانیشت، ئیشارەی بۆ زەمین کرد و وتی: ئەی زەوی، کورەکەمت سوتاند و کچەکەمت دا بەدەڵەسەگێك و خۆراگریم کرد بەڵام ئێستا ئەم بەڵایەت بەسەرداهێناوین و ئاو و توێشوی ئێمەت لەناو برد و بەرەو لەناوچوون دەڕۆین.

ژن وتی: ئەگەر خۆراگریت دەکرد، بۆ تۆ باشتر بوو بەڵام ئێستا تۆ لەنهێنییەکانی کارەکانی خۆم ئاگادار دەکەمەوە: دوژمنەکەی تۆ وەزیرەکەتی فریودا و ئەو ئاو و خواردنی تۆی ژەهراوی کرد تا تۆ و هاوەڵانت بکوژێت. فەرمان بەوەزیرەکەت بدە لەئاو و توێشوەی ماوەتەوە بخوات. پاشا ئەم کارەی کرد بەڵام وەزیر نەیخوارد. پاشا ئەوی کوشت. ژنی پەریزاد شوێنێکی نزیکی نیشاندا کە ئاو و توێشوی لێبوو. ژن

وتی: کورەکەتم بەدایە سپارد تا بەخێوی بکات بەڵام مرد. ئێستا تەنیا کچەکەت زیندووە. لەمکاتەدا کچێك لەزەوی هاتە دەر. بلقیس بوو. ژن لێی جیابوویەوە و پاشا رۆشتە شەری دوژمن و بەسەریدا سەرکەوت.

لەبارەی هاوسەر گرتنی ئەو لەپەرییەکان ئەفسانەیتریشیان باس کردووە کەهەموویان گومانی بێ بنەمایە و لەراستییەوە دوورە.

داستانی پاشایەتی ئەویان بەسەر یەمەن بەم شێوە باسیان کردووە: باوکی ئەوی کردە جێگری خۆی و دوای ئەو بوو بەفەرمانرەوا. دەستەیەك دەڵێن: باوکی بێ پێشنیار(وەسیەت)مرد و کەسی بۆ جێگری خۆی هەڵنەبژارد. خەڵك برازاکەی ئەویان بۆ پاشایەتی هەڵبژارد و ئەو پیاوێکی قێزەون و خراپەکاربوو کە لەبارەی هەر کچێك لەگەورەکان یا هەر شاکچێك، قسەیان بۆدەکرد، بانگی دەکرد و ریسوای دەکرد. نۆرەی ئەم کارە بەبلقیس گەشت کەکچە مامی بوو. داوای پێکەوە خەوتنی لەبلقیس کرد و بلقیس موژدەی پێدا لەکۆشکەکەی ئەچێتە لای. بلقیس بۆ ئەو دوو پیاوی لەنزیکەکانی خۆی ئامادە کرد و فەرمانی پێدان: کاتێك پاشا هاتە لای من و لەگەڵ من بە تەنیا مایەوە بیکوژن. کاتێك پاشا هاتە لای ئەو کچە، ئەو دوو پیاوە هێرشیان کردە سەری و خوێنیان رژاند. کاتێك پاشا کوژرا، ئەو وەزیرەکانی پاشای بانگ کرد و سەرکۆنەی کردن و وتی: ئایا لەناو ئێوەدا پیاوێك نەبوو غیرەتی بۆ کچەکانی خۆی و کچەکانی خەڵك بجووڵێت؟ لاشەی پاشای نیشاندان و وتی: پیاوێك هەڵبژێرن و بیکەنە پاشای خۆتان. وتیان: جگە لەتۆمان ناوێت. ئەویان کردە پاشای خۆیان.

دەستەیەك دەڵێن: باوکی پاشا نەبوو بەڵکو وەزیری پاشا بوو. پاشا پیاوێکی خراپەکار بوو کەکچی گەورەکان و راوێژکاران و وەزیرەکانی دەگرت و ریسوایی دەکردن. ئەو ژنە پاشای کوشت و خەڵك ئەویان بەپاشایەتی هەڵبژارد.

بەمشێوەیە، پاشایەتی و فراوانی سوپاکەی ئەویان گەورە کردۆتەوە. دەڵێن: چوارسەد پاشا لەژێر فەرمانی ئەودا بوو. هەرکام فەرمانرەوایەتی شارێکی دەکرد و هەرکام چوار هەزار پیاوی شەرکەری بوو. ئەو سێسەد وەزیری بوو کەسەرقاڵی رێکخستنی کاروباری وڵاتەکەی بوون. دوانزە فەرمانەدی بوو کەهەرکام فەرمانەدیی دوانزە

هەزار پیاوی شەڕکەری لەنەستۆدا بوو.

کەسانیتر بابەتەکەیان گەیاندۆتە شوێنێك کەباس لەنەزانی و گێژی ئەوان دەکات. دەڵێن: دوانزە هەزار لەگەورەکان (یا فەرماندەکان) لەژێر فەرمانی ئەودا بوون کەهەر کام لەوان سەد هەزار پیاوی شەڕکەری بووە و هەر پیاوێکی شەڕکەر حەفتا هەزار لەشکری بووە کە لەهەر لەشکرێك حەفتا هەزار کەس بوون و ئەمانە هەمووی لەلاوی بیست و پێنج ساڵە پێکدەهاتن. تا ئێستا باوەڕم نەکردووە باسکەری ئەم درۆ گەورەیە ژمێریاری زانیبێت تا ئەندازەی نەزانی خۆی هەڵسەنگێنێت. ئەگەر ژماردنی دەزانی لەوتنی ئەم درۆیە خۆی بەدوور دەگرت چوونکە هەموو خەڵکانی سەر زەوی بە پیر و لاو و ژن و پیاوە ناگەنە ئەم ژمارەیە. ئێستا چۆن لاوانی تەمەن بیست و پێنج ساڵ دەتوانن ئەم ژمارە (ئاسمانییە) پێکبهێنن؟ خۆزگە دەمزانی خەڵکانی زیاتر یا کەمتر لەبیست وپێنج ساڵ چەندە بوون و مسکێنەکانی ناوا ولاتێك لەگەڵ پیشەوەران و جوتیاران و کەسانیتر دەگەشتنە چ ژمارەیەك؟ چوونکە سوپاییەکان کەمێکی کەم لەولاتن. ئەگەر بەرهەمەکانی ولاتی یەمەن لەسەردەمی ئێمەدا کەمی کردووە، پانتایی زەوییەکەی کەمی نەکردووە و لەبەر ئەمە پانتایی ئەم ولاتە توانای ئەوەی نییە ئەم هەموو کەس بەوەستان لای یەکتر تیایدا بجولێنەوە.

دواتر دەڵێن: ئەو بۆ دەلاقەی ماڵەکەی کەتیشکی هەتاو لێی دەهاتە ناو و ئەو پەرەستشی دەکرد، هەزار وەقیە (هەر وەقیەیەك ٧ مسقال و نیو) زێڕی خەرج کرد. جیاواز لەمانە شتیتریشیان وتووە. لەبارەی تەختەکەیشی دەڵێن کەشیاوە بۆ سوپاکەی ئەو و ئێمە بەئاماژەدان پێی درێژدادڕی ناکەین. ئەوان لەسەر درۆکردن و گەمە کردن بەئەندێشەی نەزانەکان هاودەست بوون و نەیانزانی چ بەدبەختییەکیان لەمێژوودا بەسەردێت کەزاناکان ئەوان سوك و ریسوا دەکەن. ئێمە ئاماژەمان بەم قسانەدا تا هەندێ لەوانەی باوەڕ بەم قسانە دەکەن لەچەندایەتی و چۆنایەتییەکەی ئاگادار ببنەوە و بەراستی و دروستی هەڵیسەنگێنن.

هۆکاری هاتنی بۆ لای سلێمان و خواپەرەست بوونی ئەوە بوو سلێمان لەنێوان

باڵندەکان بەدوای شانەبەسەردا گەرا بەڵام نەیدۆزییەوە. بۆیە بەدوایدا گەرا چوونکە شانەبەرسەر ئاو لەژێر زەویدا دەبینێت و دەزانێت لەو زەوییە ئاو هەیە یانە، نزیکە یا دوور. سلێمان لەیەکێك لەشەڕەکانی پێویستی بەئاو بوو بەڵام هیچ کام لەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون، ئەندازەی دووری ئاویان نەدەزانی. بەدوای شانەبەرسەردا گەرا تا چۆنییەتیەکەی لێبپرسێت، بەڵام نەیدۆزییەوە.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو، بەڵکو خۆر هاتە سەر سلێمان و سەیری کرد تا بزانێت لە کوێدا دابەزیوە چوونکە باڵندەکان سێبەریان بۆ دروست کردبوو. سەیری کرد و شوێنی شانەبەسەری بەچۆڵ بینی. وتی: بێ گومان سەری دەبڕم یا بەسەختی ئەشکەنجەی دەکەم یا بیانوێکی رون و ئاشکرام بۆ دەهێنێتەوە (نمل/٢٧/٢١).

شانەبەسەر لەم کاتەدا لەسەرکۆشکەی بلقیس تێپەڕیبوو، لەپشتیەوە بێستانێکی بینیبوو. روی کردە سەوزەلانی و لەوێ شانەبەسەرێکی بینی وپێی وت: تۆ لەکوێیت و سلێمان لەکوێ؟ لێرەدا چی دەکەیت؟ شانەبەسەری بلقیس وتی: سلێمان کێ بێت؟ ئەمەیتریان داستانی سلێمان و دەستەمۆبوونی باڵندەکان و شتەکانیتری بۆ باس کرد و شانەبەسەری بلقیس سەریسورما. شانەبەسەری سلێمان پێی وت: سەرسورهێنەرتر لەوە، ئەو خەڵکەن کەژنێك فەرمانرەوایەتیان دەکات. ئەم ژنە هەموو شتێکیان پێبەخشیوە و ئەو تەختێکی زۆر گەورەی هەیە (نمل/٢٧/٢٣).ئەوان بەمشێوە سپاسگوزاری خوا دەکەن کەجیاواز لەخوا نوێژ بۆ خۆر دەبەن. تەختەکەی ئەو زێرین و رازاوە بەگەوهەرە گرانبایەکان و یاقوت و مروارید بوو.

دواتر شانەبەسەر گەرایەوە بۆ لای سلێمان و داوای لێبووردنی کرد بۆ دیار نەمانی. سلێمان پێی وت: ئەم نامەی من بۆ ئەو ژنە ببە و بۆی بهاوێژە. شانەبەسەر کاتێك ژنەکە لەناو کۆشکەیدا بوو پێی گەشت و نامەکەی خستە داوێنییەوە. ژن نامەکەی سلێمانی هەڵگرتەوە و خوێندی و خەڵکەکەی خۆی کۆدکردەوە، وتی: ئەی خەڵکینە نامەیەکیان بۆ منیان هێناوە. نامەکە لەسلێمانە و تیایدا نوسیویەتی: بەناوی خوا بەخشەندە و میهرەبان. ئاگادار بن لەبەرابەر من یاخیگەری مەکەن، وەرن بۆ لای من هاوشێوەی ملکەچان. دوبارە وتی: ئەی خەڵکینە، لەم کارەدا هاریکارم بن چوونکە هیچ کارێم ئەنجام نادەم مەگەر ئەوەی ئێوە ئاگادار بن و شایەتی بدەن. خەڵکەکەی

وتیان: ئێمە هێزێکی زۆرین و ساز و بەرگی شەڕی فراوانمان هەیە و کار لەدەست تۆدایە، فەرموو تا بزانین چی دەفەرموویت. ژن وتی: کاتێك پاشاکان و فەرمانڕەواکان دەڕۆنە ناو شار و ولاتێك، لەناوی دەبەن و خەڵکە بەرێزەکەی سوك و ریسوا دەکەن. دیاریەکیان بۆ دەنێرم تا بزانم نێردراوان چ وەلامێك دەهێننەوە (نمل/٢٧/٢٩—-٣٥). ئەگەر دیارییەکە وەربگرێت لەپاشاکانی ئەم دنیایە و ئێمە لەو بەهێزتر و لەپێشترین، ئەگەر رازی نەبێت ئەو یەکێك لەپێغەمبەرانی خودایە.

کاتێك دیارییەکە هاتە لای سلێمان ، سلێمان بەنێردراوانی وت: ئایا بەسامانی ئەم دنیایە یارمەتی من دەدەن؟ ئەوەی خوا بەمنی بەخشیبوە باشترە لەوەی نێوە هەتانە بەلام نێوە لەدیارییەکەی خۆتان شادمانن. بۆ لای ئەوان (خەڵکی ولاتی بلقیس) بگەڕێنەوە و بزانە بێ گومان بەسوپایەك هێرشیان دەکەینە سەر نەتوانن خۆڕاگری بکەن و بێ گومان ئەوان لەماڵەکانیان دەردەپەڕێنین هاوشێوەی ریسوا و سەرشۆڕەکان (نمل/٢٧/٣٦—-٣٧). کاتێك نێردراوان بۆ لای ئەو ژنە گەڕانەوە، بۆ لای سلێمان بەرێکەوت و گەورەپیاوانی ولاتەکەی لەگەڵ خۆیدا برد و ئەمانە فەرماندەی سوپاکەی بوون. هاتە لای سلێمان، نزیکەی فەرسەنگێك لێی دووربوو. سلێمان بەهاوەلانی خۆی وت: کام یەك لەنێوە تەختی ئەو ژنە دێنێتە لای من پێش ئەوەی خەڵکەکەی بێنە لای من ئەی باوەرداران؟ گاڵتجارێك وتی: من ئەو تەختە پێش ئەوەی لەشوێنەکەی خۆت هەستی دێنمە لای تۆ، من بەتوانا و پارێزەرێکی بەهێزم (نمل/٢٧/٣٩). یانی پێش ئەوەی لەشوێنەکەی خۆت هەستیت بەمەبەستی رۆشتن بۆ ماڵ بۆ خواردنی نانی نیوەرۆ، دەیهێنمە لای تۆ. سلێمان وتی: لەمە زووتر. لەم کاتەدا، پیاوێك کەزانستێکی خوایی پێبرا بوو وتی: ئەو تەختە پێش ئەوەی بینینی چاوت بۆ تۆ بگەڕێتەوە دەیهێنمە لای تۆ- ئەم پیاوە ئاسف کوڕی بەرخیا بوو و گەورەترین ناوی خوای دەزانی- (نمل/٢٧/٤٠). زانا پێی وت: سەیری ئاسمان بکە و بە دوای روانینەکەت برۆ و روانینی چاوت بۆ تۆ ناگەڕێتەوە مەگەر ئەوەی ئەو تەختە بێنمە بەردەم تۆ( لەچاو تروکانێکدا دەیهێنمە لای تۆ). زانا سەری خستە سەر زەوی و لەخوا پاڕایەوە. سلێمان بینی تەختی ئەو ژنە لەژێر تەختەکەی هاتە دەر. دواتر وتی: ئەمە لەبەخشینەکانی خوایە تا تاقیم بکاتەوە کە ئایا — سپاسگوزار بم یا

ناسپاس دەکەم (نمل/٢٧/٤٠) چوونکە کەسێکی کردە ژێردەستەی من کە بەتواناتر لەمن بۆ هێنانی ئەم تەختەیە.

کاتێك ژنەکە هات پێیان وت: ئایا تەختەکەی تۆ بەم شێوەیە؟ ژن وتی: دەڵێی ئەوەیە (نمل/٢٧/٤٢). لەناو قەڵاکان دامناوە و چەندین پاسەوانم بۆ دیاریکردووە. بەڵام تەختەکە چۆن گەشتۆتە ئێرە؟

سلێمان بەدێوەکانی وت: بۆمن کۆشکێك دروست بکەن تا بلقیس لەوێ دابەزێت و لەوێ چاوی بەمن بکەوێت. دەستەیەك لەدێوەکان وتیان: ئەم هەمووە لەکەسەکان و شتەکان گرفتار و بەندی سلێمانن و ئێستا ژنێك بەناوی بلقیس، پاشای سەرزەمینی سەبا هاتۆتە لای. سلێمان وەك هاوسەر هەڵیدەبژێرێت و ئەو کورێکی بۆ دێنێتە دنیا و ئێمە هەمیشە لەکۆیلایەتیدا ژیان بەسەر دەبەین. بلقیس قاچەکانی توکن بوو. ئەو دێوەی ئەمەی وت زیادی کرد: بۆ سلێمان کۆشکێك دروست بکەن تا قاچە تووکنەکانی بلقیس ببینێت و ئەو وەك هاوسەری خۆی هەڵنەبژێت. دێوەکان بۆ سلێمان کۆشکێکیان لەشووشەی سەوز دروست کرد و خشتی شوشەییان تیا بەکار برد. ئەو کۆشکە هاوشێوەی ئاو دەهاتە بەرچاو. لەژێر ئەو شوشانە روخساری ئاوزییەکان و ماسیەکانیان و شتیتریان کێشا (یاماسی و گیانەوەرە ئاوزییەکانی تریان لەناو ئەو ئاوگیرەدا بەرەڵا کرد چوونکە پڕیان کردبوو لەئاو). سلێمان لەسەر تەخت دانیشت و فەرمووی بلقیسیان هێنایە لای. کاتێك بلقیس وێستی بڕواتە ناو کۆشکەکە، گومانی کرد ئاوەکە قووڵە، دەیزانی ئاو لەژێر بیناکەدایە. داوێنی لەپێی خۆی بەرز کردەوە تا بڕواتەناو. کاتێك سلێمان ئەمەی بینی، پشتی تێکرد (تا چاوی بەنارەوایی بەژنێك نەکەوێت). سلێمان وتی: ئەم کۆشکە لە ووشەی بلوور دروست کراوە. بلقیس وتی: خوایە ستەمم لەخۆم کرد بەهەتاو پەرەستی و ئێستا لەگەڵ سلێمان رودەکەمە خوا پەرەستی کەخواەندی جیهانیانە(نمل/٢٧/٤٢-٤٤).

سلێمان لەگەڵ کەسەکانی خۆی راوێژی کرد تا شتێك بدۆزێتەوە موو هەڵبگرێت و زیان بەپێستی جوانی ژن نەگەیەنێت. دێوەکان نورەیان بۆ دروست کرد و بلقیس یەکەم کەس بوو بەکاریهێنا. سلێمان ئەوی کردە هاوسەری خۆی و عاشقی بوو. ئەوی بۆ پاشایەتی لەیەمن گەڕاندەوە. سلێمان مانگی سێ رۆژ دەرۆشتە سەردانی و بۆ

ماوەی سێ رۆژ لای دەمایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: سلێمان پێی وتپیاوێك لەخەڵكەكەی خۆی وەك هاوسەری دیاری بكات بەلاَم بلَقیس ئەم كارەی پەسەند نەكرد و رازی نەبوو. سلێمان وتی: لەئایینی ئیسلام جگە لەمە رِەوا نییە. بلَقیس وتی: ئەگەر بەناچار دەبێت ئەم كارە بكرێت، من بدە بە زوتەبع پاشای هەمەدان. سلێمان كردییە هاوسەری ئەو پاشایە و بۆ یەمەنی نارد و زوتەبعی هاوسەری ئەوی كردە پاشا و فەرمانی بەپەرییەكانی یەمەندا گوێرایەڵی فەرمانەكانی بن. زوتەبع پەرییەكانی بەكار برد و ئەوان چەندین قەلاَیان بۆ دروست كرد كە لەناویاندا: سلحین (سلخین)، مراوح، فلیۆن، هیندە و ... كاتێك مرد، پەرییەكان فەرمانیان لەزوتەبع نەبرد و پاشایەتی ئەو لەناوچوو و بلَقیس هاورێ لەگەڵ سلێمان بەپاشایەتی دانیشت.

دەستەیەك دەڵێن: بلَقیس پێش سلێمان لەشام مرد و سلێمان ئەوی لەتەدمور بەخاك سپارد و ئارامگاكەی شاردەوە.

## داستانی شەرکردنی سلێمان لەگەڵ باوکی ژنەکەی خۆی جەرادە و پەیوەندی ژن و مێردایەتی ئەو لەگەڵ ئەو کچە لەماڵەکەی و لێسەندنی ئەنگوستیلەکەی و گەڕاندنەوە بۆی

دەڵێن: سلێمان ناوبانگی پاشایەکی بیست کە لەیەکێك لەدوورگەکانی زەریا پاشایەتی دەکات و کارێکی مەزن و فەرمانێکی بەهێزی هەیە و خەڵك ناتوانن برۆنە لای. سلێمان بەرەو ئەو دوورگە رۆشت و با ئەوی لەگەڵ سوپاکەی بردە ئەوێ. لەگەڵ لەشکرەکەی لەوێ دابەزی و پاشاکەی کوشت و سامانەکانی تالأن کرد ویەکێك لەکچەکانی ئەو پاشایەی دەست کەوت کەکەس کچی بەو جوانییەی نەبینیبوو. سلێمان وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و پێشنیاری خواپەرستی پێکرد و ئەویندار بوو. بەڵام کچەکە بەردەوام خەمبار و هەمیشە بە نازارەوە دەگریا. سلێمان پێی وت: هاوار لەتۆ! ئەمە چ خەمێکە و کام کانی فرمێسکە وشك نابێت؟ کچ وتی: باوکم و پاشایەتیەکەی بیردێنمەوە و دەبینم چی بەسەردا هاتووە و ئەمە خەمبارم دەکات. سلێمان وتی: خوا پاشایەتی بەشکۆتری بەتۆ بەخشیوە و تۆی بۆ رێگەی راست و گەڕانەوە بۆ لای خوا رێنوێی کردووە. کچ وتی: وایە بەڵام کاتێك بیری باوکم دەکەمەوە، هەر ئەوەندەی دەبینی خەم دامدەگرێت. ئەگەر دەتەوێت فەرمان بەدێوەکان بدە پەیکەرەکەی لەماڵەکەمدا دروست بکەن بۆ ئەوەی بەیانیان و شەوان بیبینم و خەمەکانم کەم ببێتەوە.

سلێمان فەرمانی بەدێوەکان دا پەیکەرێکی هاوشێوەی باوکی ئەویان دروست کرد بێ هیچ کەم وکوڕییەك. جلێکی هاوشێوەی جلی باوکی کچەکەیان کردە بەر پەیکەرەکە. کاتێك سلێمان دەرۆشتە دەر ئەو کچە لەگەڵ کەنیزەکانی خۆی دەرۆشتە لای ئەو پەیکەرە و نوێژی بۆ دەبرد و دەیپەرەستی. ئەم کارە چل رۆژی خایاند و سلێمان ئاگادار نەبوو.

ئەمە گەشتە گوێی ئاسف کوڕی بەرخیا. پیاوێکی راستبێژ و راست کردار بوو. هەر کات دەیویست دەرۆشتە ناو ماڵەکانی سلێمان جا چ سلێمان لەماڵ بووایە چ لەماڵ

نەبووایە. جارێك هاتە لای سلێمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕۆژگاری من درێژ بۆتەوە و ئێسقانەکانم سووك و سست بوون و کاتی مەرگم هاتووە. دەمەوێت برۆمە شوێنێك و پێغەمبەرەکانی خوا ببینم و ڕێزیان لێبگرم و بۆ زانستی خۆم سپاسی ئەوان بکەم و بەشێك لەو زانیارییانە فێری خەڵکان بکەم کەنایزانن. سلێمان وتی: ئەم کارە بکە. رازی بوو و سلێمان خەڵکی بۆ کۆکردەوە و ئاسف دەستی بەوتار خوێندنەوە کرد و بیری پێغەمبەرەکانی کردەوە و وەسفی کردن تا گەشتە سلێمان و لەبارەی ئەو وتی: چ گەورەپیاوێك و فرمزانێك بوویت لەمناڵیدا! چۆن بوو لەهەر خراپەیەك دووریت دەکرد. لەمناڵیدا؟ ئەمەی وت و بەرێگای خۆیدا ڕۆشت.

سلێمان تووڕە بوو، بانگی کرد و وتی: ئەی ئاسف، کاتێك باسی منت کرد ڕێزت لەبچوکی و کەم تەمەنی من گرت و بۆ زیاتر لەوە بێدەنگ بوویت. مەگەر لەکۆتاییدا چیم کردووە؟ ئاسف وتی: چل ڕۆژە لەماڵەکەی تۆدا جگە لەخوا دەپەرستن و ئەمە دوواهاتی دۆرانی تۆ لەبەرابەر ژنێکی جوانە. سلێمان وتی: ئێمە لەخواین و هەمووومان بۆ ئەو دەگەرێنەوە (انا لله و انا اليه راجعون) (بقرە/٢/١٥٦). دەمزانی لەخۆوە قسە ناکەیت. سلێمان هاتە ماڵەکەی خۆی و بتەکەی شکاند و ژن و کەنیزەکانی سەرکۆنە کرد. ئەوسا فەرمانیدا جلی (پاکیزەیی) بێنن. جلێك بوو ئەو کچانەی خوێنی مانگانەیان نەبینیوە دەیرێسن و دەیچنن و ژنێك کەخوێنی بینیبیت دەستی لێنادات. سلێمان ئەم جلەی لەبەر کرد و ڕوی کردە بیابان و خۆڵەمێشی بڵاو کردەوە و دواتر گەرایەوە بۆ لای خوا و بەو جلە پاکە لەسەرخۆڵەمێش تلی خوارد تا لەخوبووردویی خۆی لەبەرابەر خوا نیشان بدات. چل ڕۆژ گریا و داوی لێخۆشبوونی کرد و دواتر گەرایەوە بۆ ماڵی خۆی.

سلێمان کەنیزێکی هەبوو کە مناڵێکی لەو کەنیزە بۆ هاتبووە دنیا جگە لەو باوەری بەکەس نەدەکرد و بەردەوام ئەنگوستیلەکەی خۆی بەو دەسپارد. تەنیا کاتێك دەرۆشتە ئاودەست یا دەیویست لەگەڵ ژنێکدا بخەوێت، ئەنگوستیلەکەی دەردەهێنا و دەیدا بەو ژنە و کاتێك خۆی لەئاودا دەشۆرد و خۆی پاك دەکردەوە، ئەنگوستیلەکەی دەکردەوە پەنجە. نهێنی پاشایەتی و بەهێزی لەو ئەنگوستیلەدا شاراوە بوو. لەیەکێك لەو ڕۆژانە (دوای داستانی بت پەرستینی ئەو ژنە جوانە لەماڵەکەیدا) ڕۆشتە

ناودەست و ئەنگوستیلەکەی خۆی بەو ژنە سپارد. لەم کاتەدا دێوێك بەناوی (صخر) لەروخساری سلێمان دەرکەوت و ئەنگوستیلەکەی لەو ژنە وەرگرت و رۆشت لەسەر تەختی پاشایەتی سلێمان دانیشت. روخساری هاوشێوەی سلێمان بوو. ئەو لەسەر تەخت دانیشت و هەموو خەڵکان وپەرییەکان و دێوەکان فەرمانبرداری بوون. سلێمان لەناودەست هاتەدەر و داوای ئەنگوستیلەکەی لەژن کرد. وتی: ئەنگوستیلەکەم! ژن وتی: تۆ کێ بیت؟ وتی: سلێمانم. ژن وتی: درۆ دەکەیت. سلێمان هات و ئەنگوستیلەکەی لەمن وەرگرت و ئێستا لەسەر تەختەکەی خۆی دانیشتووە. سلێمان گوناح و تاوانەکەی خۆی زانی. هاتە دەر و بەمناڵەکانی مناڵەکانی ئیسرائیل دەوت: من سلێمانم. ئەوان خۆڵیان دەکرد بەسەر وچاویدا. کاتێك بەم شێوەی بینی رویکردە دەریا و لەوێ دەستی بەکار کردن کرد. کۆڵکێشی دەکرد و ماسی ماسیگرەکانی دەبردەوە و ئەوان یەك دوو ماسیان پێدەدا، یەکیانی دەفرۆشت و نانی دەکری و ئەویتریانی دەخوارد. چل رۆژی بەم شێوەیە ژیانی بەسەر برد.

دواتر ئاسف کوڕی بەرخیا و دەستەیەك لەگەورەکانی مناڵەکانی ئیسرائیل، هەڵس و کەوتی ئەو دێوە سلێمان ئاسایەیان بەقێزەون و ناشیرین بینی. ئاسف وتی: ئەی مناڵەکانی ئیسرائیل، ئایا دوو لایەنی هەڵس و کەوتی سلێمان و نەگونجاوی کارەکانی ئەو دەبینن؟ وتیان: بەڵێ: وتی: مۆڵەتم بدەن، دەرۆمە لای ژنەکانی سلێمان و لەوان دەپرسم ئایا وەك ئێمە هەڵس و کەوتی سلێمان سەرسوڕماوی کردوون یا نە. هاتە لای ژنەکان و پرسی و ژنان شتی خراپتر لەویان دەزانی، و گێڕایانەوە. ئاسف کوڕی بەرخیا وتی: ئێمە لای خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. ئەمە گەورەترین تاقی کردنەوەی خواییە (بقرە/٢/١٥٦، صافات/٣٧/١٠٦).

ئاسف هات و بەسەرهاتەکەی بۆ مناڵەکانی ئیسرائیل گێڕایەوە. کاتێك دێو زانی ئەوان لەنهێنی کارەکەی ئاگادار بوون، لەوێ هەڵفڕی و بەسەردەریادا تێپەری کرد و ئەنگوستیلەکەی خستە ناو زەریا. یەکێك لەماسیەکان ئەنگوستیلەکەی قووتدا و ماسیگرێك ڕاوی کرد و سلێمان لەو رۆژەدا بۆ ئەم ماسیگرە کاری دەکرد. ئەو دوو ماسی پێدا کەیەکیان ئەو ماسییە بوو ئەنگوستیلەکەی قوتدابوو. سلێمان ئەو ماسیەی گرت و لەتی کرد تاپاکی کات و بیخوات. ئەو ئەنگوستیلەکەی خۆی لەناو

سکیدا بینی و هەڵیگرتەوە و کردییە پەنجەی. کەوتە سەر زەوی و نوێژی بۆ خوابرد و خەڵکان و پەرییەکان و دێوەکان لەدەوری کۆببوونەوە. گەرایەوە سەر تەختی پاشایەتی و خەڵکان فەرمانبرداری بوونەوە. گەرایەوە بۆ فەرمانرەوایی و پەشیمانی لەگوناحەکەی خۆی ئاشکرا کرد و دێوەکانی بۆ دۆزینەوەی سخر نارد کەئەنگوستیلەکەی دزیبوو. ئەوەیان هێنا و سلێمان تاشەبەردێکی هێنا و کونی کرد. دێوەکەی کردە ناوی و بەئاسن و مسی کولاّو داپۆشی و خستیە ناو دەریا.

مانەوەی ئەو دێوە لەسەر تەختی پاشایەتی چل رۆژ بەئەندازەی پەرستینی بت لەماڵەکەی سلێمان درێژەی کێشا.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری لەدەست چوونی پاشایەتیەکەی ئەمەیە: هاوسەرێکی بوو بوو بەناوی جەرادە کە لەباشترین و کردار شیرینترین ژنەکانی بوو. سلێمان لێی رازی بوو، جگە لەو باوەری بەکەس نەدەکرد و ئەنگوستیلەکی جگە لەو بەکەسیتر نەدەدا. ژن پێی وت: براکەم لەگەڵ فلاّن کەس کێشەی هەیە و ئارەزومە لەبەرژەوەندی ئەودا داوەری بکەیت. سلێمان وتی: ئەم کارە دەکەم. بەلاّم ئەیکرد وگرفتاری تاقی کردنەوە بوو. ئەو ئەنگوستیلەیکەی دا بەو ژنە و رۆشتە ئاودەست. دێو لەروخساری ئەو دەرکەوت و ئەنگوستیلەکەی گرت. سلێمان هاتەدەر و داوای ئەنگوستیلەکەی کرد. ژن وتی: ئایا وەرت نەگرت؟ سلێمان وتی: نە. ئەوکات سەرگەردان لەشوێنەکەی هاتەدەر و دێو چل رۆژ مایەوە و فەرمانڕەوایی بەسەر خەڵکدا دەکرد. خەڵك لەنهێنی کارەکەی تێگەشتن و دەوریان گرت و تەوراتیان هێنا و خوێندیان و دێو لەناویاندا رایکرد و ئەنگوستیلەکەی فرێدایە ناو دەریا. ماسیەك گرتی و قوتیدا. لەم کاتەدا سلێمان رویکردە ماسیگرێك (ئەو برسی بوو) و داوای خواردنی لێکرد و وتی: من سلێمانم. ئەو ماسیگرە بەدرۆزنی زانی و لێیدا و سەری شکاند. سلێمان خوێنەکەی پاك کردەوە و ماسیگرەکان هاوکارەکەی خۆیان سەرکۆنە کرد و دوو ماسیان بەسلێمان دا کە یەکیان ئەو ماسییە یانی هەڵگری ئەنگوستیلەکە بوو. سلێمان ورگی هەڵدری و ئەنگوستیلەکەی هەڵگرتەوە و خوا پاشایەتی بۆ گەڕاندەوە و خەڵك داوای لێبووردنیان لێکرد. سلێمان وتی: نە لەداوای لێبووردنتان سپاسگوزارم و نەلەوەی کردتان گلەییم هەیە.

خوا دێو و پەری و خەڵك و بای دەستەمۆ و کردە فەمانبرداری سلێمان و ئەم کارەی بۆ کەسێك پێش ئەو نەکردبوو. ئەم گێرانەوەیە لەنایەی قورئانی نزیکترە و ئەویش ئەوەیە کەخوای گەورە دەفەرمێت: سلێمان وتی: خواوەندا، لەمن خۆشبە و پاشایەتییەکی شکۆمەندم پێ ببەخشە کەدوای من شیاو نەبێت بۆ کەس کەبێ گومان تۆ خواوەندێکی بەخشینەکانت فراوان. ئێمە با مان بۆ ئەو رام و دەستەمۆ کرد. مەبەستی هەر شوێنێکی دەکرد، نەرم و ئارام و بە ئەندازە دەڕۆشتە ئەوێ. لەدێوەکان هەموو داوەران و گەوهەرخوازەکانمان کردە فەرمانبرداری ئەو. دەستەیەکیان بەهێز لە ناو بەندەکاندا بەسترابوونەوە(ص/٣٨/٣٥—٣٨).

کەسانیتر ئاماژەیان بەهۆکاریتر بۆ لەناو چوونی پاشایەتییەکەی داوە.

## مردنی سلێمان

کاتێك خوا پاشایەتی بۆ سلێمان گەڕاندەوە، کامەران و فەرمانڕەوا مایەوە و پەرییەکان کاریان بۆ دەکرد و هەرچی دەویست لەنوێژگە و پەیکەر بۆیان دروست دەکرد و کاسەکان بەئەندازەی ناوگرەکان و دیگە بەهێزەکان لەسەر جێ (سەبا/٣٤/١٣). جگە لەمەیش دروستیان دەکرد و ئەو هەر کام لەدێوەکانی بوویستایە ئەشکەنجەی دەکرد و پێویستی بەهەرکامیان بووایە بانگی دەکرد. بەم شێوەبوو تا رۆژگاری ئەو کۆتایی پێهات. عادەتی بەمە گرتبوو کەهەر رۆژێك نوێژی دەخوێند، دارێکی ڕواوی لەبەر دەم خۆیدا دەبینی . دەیوت: ناوت چییە؟ دەیوت: ئەمە و ئەوە. سلێمان دەیوت: بۆچ کارێك دەبیت؟ ئەگەر بۆ چاندن بوو، دەچێندرا و ئەگەر بۆ دەرمان، نوسراو دەهات. رۆژێك کەنوێژی دەخوێند، دارێکی ڕواوی لەبەردەم خۆیدا بینی. لێی پرسی : ناوی تۆ چییە؟ وتی: خەرنوب. سلێمان پرسی: بۆ چی ڕواویت؟ دار وتی: بۆ وێرانی ئەم ماڵە یانی بیت المقدس. سلێمان وتی: تا من زیندوو بم، خوا وێرانی ناکات. تۆ ئەوەیت لەروخساری تۆ لەناوچوونی من و وێرانی ئەم ماڵەی نوسراوە! سلێمان ئەو دارەی لەشوێنەکەی هەڵکەند و وتی: خوایە: خوایە نهێنی من لەپەرییەکان دابشارە تا خەڵکان بزانن پەرییەکان نهێنییە کۆتاییەکان نازانن.

سلێمان هەندێ کات یەك ساڵ یا دو ساڵ یا یەك مانگ یا دو مانگ یا زیاتر یا کەمتر لەوە لەبیت المقدس بەتەنیا دادەنیشت و خواردن و جل و بەرگی لەگەڵ خۆی دەبرد و خوای دەپەرەستی. کاتێك وادەی مەرگی هاتە پێش، ئەوانی لەگەڵ خۆیدا بردە ئەوێ و رۆژێك کەپاڵی بەداردەستەکەی خۆی دابوو و نوێژی دەخوێند، کاتی کۆتایی هات و مرد. دێو و پەرییەکان نەیانزانی. ئەوان لەبەندی فەرمانی ئەودا گرفتار بوون و لەترسی ئەو دەستیان لەکار نەدەکێشایەوە. دوای ماوەیەك مۆریانەکان داردەستەکەی ئەویان خوارد، داردەستەکە شکا و سلێمان کەوت. خەڵك زانیان پەرییەکان نهێنییە کۆتاییەکان نازانن و ئەگەر دەیانزانی، لەو رەنجە ریسواکەر و ئەنجامی ئەو کارە دژوارانە گرفتار نەدەمانەوە (سبا/٣٤/١٤).

کاتێك سلێمان کەوت، منداڵەکانی ئیسرائیل ویستیان بزانن چ کاتێك مردووە. لەبەر ئەمە مۆریانەیان لەسەر داردەستەکە دانا تا شەوە و رۆژێك لێی بخوات و بەوپێیە،

ئەو ئەندازەی لەساڵدا خواردبووی، ژماردیان و هەڵیانسەنگاند. دێوەکان بەمۆریانەیان وت: ئەگەر خواردنت بووێت، باشترینەکەیت بۆ دەهێنین و ئەگەر پۆشاکت ویست خاوێنترینیان. بەڵام ئێمە بۆ تۆ ئاو و گوڵ دەنێرین. دێوەکانن بۆ مۆریانەکان — لەهەر کوێدا بن) شتیان بۆ دەبەن. نابینی گوڵ لەناو داردابێت؟ ئەمە ئەوەیە دێوەکان بۆ مۆریانەی دەهێنن.

دەستەیەك دەڵێن: پەرییەکان و دێوەکان لەدژواری ئەو رەنجەی دەیانبرد، گازندەیان لای لێهاتو و شارەزاکانی خۆیان کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئیبلیس بەوانی وت: مەگەر نەئەوەیە بارقورس دەرۆن و سوکە بار دەگەڕێنەوە؟ وتیان: بەڵێ. ئیبلیس وتی: ئەمە بۆ ئێوە ئارامشێك بێت. با ئەم گفتوگۆیەی هەلگرت و بەگوێی سلێمانی گەیاند. سلێمان فەرمانیدا کاتێك باری قورس و کەرەستەی بیناسازی بۆ شوێنی دورست کردن و ئاوەدان کردنەوە دەهێنن، ئەو کەسانەی لەوێن، لەکاتی گەڕانەوە، لەپڕژ و بلآوەکانی شوێنی دروست کردن و ئاوەدان کردنەوە، باریان قورس بکەن تا کاریان دژوارتر ببێت و خێراتر برۆنە پێش. ئەوان بەو بارە قورسانە لای ئەو کەس تێپەرین کەگازندەیان لای کردبوو. ئەویان لەرۆژگاری رەشی خۆیان ئاگادار کردەوە. وتی: چاوەروانی فراوانی بکەن کاتێك کارەکان کۆتایی پێبێت ئالۆ گۆر دەبێت و ئەم رەنجە زۆر ناخایەنێت. رۆژگاری سلێمان دوای ئەوە درێژەی نەکێشا و بەزووی مرد. ماوەی تەمەنی ئەو پەنجا و سێ ساڵ و دەورانی پاشایەتییەکەی چل ساڵ درێژەی کێشا.

## پاشاکانی ئێران دوای کەیقوباد

کاتێك کەیقوباد مرد، کورەکەی کەیکاوس کوڕی کینییە کوڕی کەیقوباد گەشتە پاشاشەتی گرتەدەست. دوای ئەوەی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، ولاتەکەی خۆی بەهێزکرد و دەستەیەك لەگەورەکانی ولآتانی دراوسێی خۆی کوشت. ئەو لەبەلخ و دەوروبەری دەژیا و لەوێ کوڕێکی بۆ هاتە دنیا و ناوی نا سیاوەخش و ئەوی نارده لای پالەوانی گەورە رۆستەم کوڕی داستان کوڕی نەریمان کوڕی جوزنەك کوڕی گرشاسپ. رۆستەم سپاسالاری سیستان و دەوروبەری بوو. پاشا کورەکی خۆی بەرۆستەم سپارد تا پەروەردەی بکات. رۆستەم زۆر باش پەروەردەی کرد و زانستی جۆراوجۆر و سوارکاری و هونەری شەڕکردن و زۆرانبازی و تیرهاویشتن و پیاوەتی و جوامێری فێرکرد و فەرهەنگ و هەر شتێك پاشاکان پێویستیان پێی بێت. کاتێك گەورە بوو و گەشەی کرد، بردیە لای باوکی کە لەبینینی روخساری ناوەکی و دەرەکی پەیکەر و فەرهەنگی ئەو شادمان بوو.

باوکی کەیکاووس، کچی ئەفراسیاب شای تورکانی (توران) وەك هاوسەر بۆ هەڵبژاردبوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەم ژنە کچی پاشای یەمەن بوو. ژنی کەیکاووس شەیدای سیاوەخش بوو و ئەوی بۆ نزیك بوونەوە لەخۆی بانگێشت کرد بەلآم سیاوەخش رازی نەبوو. ئەو ژنە خراپەی کوڕەکەی لای باوکی هێنایە سەر زمان تا دڵی باوکی لێ پیس بکات. سیاوەخش داوای لەرۆستەمی داستان کرد نێوەنجیگەری بکات بۆ ئەوەی بینێرێتە شەڕی ئەفراسیاب، و بەمشێوەیە خۆی لەم گێژاوە دوور بخاتەوە.

سیاوەخش دەیویست بەم کارە لەباوکی دوور بکەوێتەوە تا لەفێڵی ژنی باوك بەدوور بێت. رۆستەم نێوەنجیگەری کرد و باوکی ئەوی رەوانە کرد و لەشکرێکی گەورەی کردە هاورێی. سیاوەخش بەرەو سەرزەمینی تورکەکان بەرێکەوت تا لەگەڵ ئەفراسیابدا شەر بکات. کاتێك گەشتە ئەوێ، ئاشتی لەنێوانیان سەقامگیر بوو. سیاوەخش بۆ باوکی نامەی نوسی و ئاگاداری کردەوە کەئەفراسیاب خوازیاری ئاشتییە. باوکی سیاوەخش نامەی بۆ نارد توندی بەرامبەر بنوێنێت و هێرشی بکاتە

سەر گرنگی بەپەیمان نامەی ئاشتی نەدات. سیاوەخش پەیمان شکاندنی پەسەند نەکرد و خۆی لێ دوور خستەوە. فەرمانی باوکی جێبەجێ نەکرد و زانی ئەمە هەموو فیتنەی ژنی باوکیەتی کەدەیەوێت کردەوەی ئەو لای باوکی ڤێزمون بکات. لەبەر ئەمە نامەی بۆ ئەفراسیاب نوسی و داوای ئەمانی لێ کرد تا بڕواتە لای. ئەفراسیاب وەڵامی دایەوە. نێردراوێك کە لەنێوان ئەم دووانەدا هاتوچۆی دەکرد ڤیران ویسعان(پیرانی وەیسە) بوو. سیاوەخش ڕۆشتە سەرزەمینی تورکان و ئەفراسیاب ڕێزی لێگرت و ماڵێکی پێبەخشی و مانگانەی بۆ دیاری کرد و کچەکەی خۆی وەسفافەرید (فەرەنگیس) دایکی کەیخوسەرەوی کردە هاوسەری. ئەفراسیاب لەفەرهەنگ و ئازایەتی و جوامێری سیاوەخش شتی زۆری بینی کەلەو بۆ پاشایەتی خۆی ترسا. دوژمنی نێوان ئەفراسیاب و سیاوەخش بەبووختان و قسە پشت سەر کردنی دو کوڕەکەی ئەفراسیاب و براکەی کیدەر(کە ڕژدیان بە سیاوەخش دەبرد) زیادی کرد. ئەفراسیاب فەرمانی پێدان سیاوەخش بکوژن و خوێنی بڕێژن و لەت لەتی بکەن. ژنەکەی، کچی ئەفراسیاب، بەکەیخوسرەو دووگیان بوو. تورکان کەوتنە ڕێگا چارە تا منداڵەکەی لەناو ببات بەڵام لەناو نەچوو. ڤیران (پیران) کەئەمانی سیاوەخش لەدەستی ئەودا بوو، کوژرانی بەکارێکی ڤێزمون لەقەڵەمدا و لەبارەی ئەنجامی ئەم کارە و تۆڵە سەندنەوەی ئێرانییەکان ئاگاداری کردنەوە کەرۆستەم (گەورەی پاڵەوانەکانی ئێران) و کەیکاووسی باوکی لەمە بێدەنگ نابن و ئارام ناگرن. ئەو هاوسەرەکەی سیاوەخشی بردە لای خۆی تا منداڵەکەی ببێت و منداڵەکە بکوژێت. کاتێك کوڕەکە لەدایك بوو پیرانی خۆشیویست و لەکوشتنی چاوپۆشی کرد. ئەم بابەتەی بەنهێنی هێشتەوە تا کوڕەکە گەورە و گەشەی کرد. کەیکاووس کەسانی بۆ سەرزەمینی تورکان نارد تا لەکاری کەیخوسرەو ئاگادار ببنەوە و ئەویان بەنهێنی بۆ ئێران برد.

کاتێك داستانی کوژرانی سیاوەخش بەئێران گەشت، شادوس کوڕی جودەرز(گودەرز) لەخەمدا جلی ڕەشی پۆشی و یەکەم کەس بوو ڕەشی پۆشی. هاتە لای کەیکاوس و پاشا لێی پرسی: ئەم جلە ڕەشە چییە لەبەرت کردووە؟ شادوس وتی: ئەمڕۆ ڕۆژی تاریکی و ڕەشاییە.

ئەوسا کاتێك کەیکاووس لەکوژرانی کورەکەی ئاگادار بویەوە، پاڵەوان رۆستەم و توس سپاسالاری ئیسفەهانی بەسوپایەکی گەورە رەوانەی شەری ئەفراسیاب کرد. ئەو دووانە رۆشتنە سەرزەمینی تورکان و کوشتاری زۆریان کرد و زۆریان بە دیلی گرت. لە نێوان ئەوان و ئەفراسیاب شەرِی زۆر رویدا کە دو کورەکەی و براکەی کەبۆ کوشتنی سیاوەخش هانیاندابوو، لەو شەرانەدا کوژران.

ئێرانییەکان گومان دەکەن دێوەکان دەستەمۆی کەیکاوس بوون ونەوان شارێکیان بۆ دروست کرد کەدرێژییەکەی – بەگومانی ئەوان- سێسەد فەرسەنگ بوو. ئەوان بەدەوری ئەو شارەدا دیوارێکیان لەمس و دیوارێکیان لەمسی زەرد و دێوارێکیان لەسیم دروست کرد. دێوەکان لەنێوان ئاسمان و زەمین بەرێگایان دەبرد. کەیکاوس نەدەیخوارد، نەدەیخواردەوە و نەمیزی دەکرد و نەپیسایی. دواتر خواوەند فەرمانی بەکەسانێکدا ئەو شارە وێران بکەن و دێوەکان نەیانتوانی بیپارێزن. کەیکاوس دەستەیەك لەگەورەکانی ئەوانی کوشت.

دەستەیەك لەزاناکانی ئاگادار لەمێژووی پێشینان دەڵێن: بەفەرمانی سلێمان کورِی داوود بوو دێوەکان دەستەمۆی کەیکاوس بوون و ئەو پاشایەکی بەختەوەر بوو کە لەگەڵ هیچ پاشایەك نەدەجەنگا مەگەر ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا. بەردەوام بەم شێوە بوو تا بیری لەوە کردەوە بۆ ئاسمان بفرِێت. لەسەر ئەم بنەمایە لەخوراسان تا بابل رۆشت. خوا هێزی پێبەخشی. خۆی و هاوەڵەکانی بەیارمەتی زۆر بەرز بوونەوە و گەشتنە هەورەکان. دواتر خوا هێزەی لێسەندنەوە و هەموویان کەوتن ومردن و کەیکاوس گیانی بەدەر برد. لەم رۆژەدا ئەو بۆ یەکەمجار خۆی پیس کرد.

هەمووی ئەمانە لەدرۆکانی ئێرانییەکانە.

دوای ئەم روداوانە پاشایەتی کەیکاوس روی لەناوچوون کرد و شۆرشییەکان فراوان و لە هەرلاوە شەرِیان لەگەڵدا دەکرد. هەندێکات ئەو سەردەکەوت و هەندێ کات دوژمنەکانی. دواتر رۆشتە شەرِی سەرزەمینەکانی یەمەن و پاشاکەی لەو سەردەمەدا زوالازعار کورِی ئەبرەهە زوالمنار کورِی رایش بوو. کاتێك کەیکاوس گەشتە یەمەن،

زوالازعار گیرۆدەی ئیفلیجی ببوو، بەرەو لای هات. ئەو بۆ شەر نەدەڕۆشت بەڵام چوونکە کەیکاوس هاتبوو ناو خاکەکەی، خۆی لەگەڵ سوپاکەی هاتەدەر و شەری کرد و بەسەر کەیکاوسدا زاڵ بوو و ئەوی دیل کرد و شمشێری خستە ناو سوپاکەی و خوێنی زۆری ڕشت. کەیکاوسی لەچاڵێکدا زیندانی کرد و سەرەکەی بەقایمی بەست. ڕۆستەم لەسیستانەوە بەرەو یەمەن بەڕێکەوت و کەیکاوسی ڕزگار کرد و لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرت.

زوالازعار ویستی ڕێگەی لێبگرێت. لەبەر ئەمە سوپای بەمەبەستی شەڕ کۆکردەوە و دواتر لەشکەست ترسا و هەر دولا لەسەر ئەمە ڕێکەوتن ڕۆستەم کەیکاوس لەگەڵ خۆی ببات و بگەڕێتەوە بۆ ئێران. ئەو کەیکاوسی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ ئێران. کەیکاوس لەپاداشتیدا سیستان و زابولستان لەپارێزگاکانی فارسی، بەو بەخشی و ناوی کۆیلایەتی لەسەر هەڵگرت. دواتر کەیکاوس مرد. ماوەی پاشایەتی ئەو سەد و پەنجا ساڵ درێژەی کێشا.

## پاشایەتی کەیخوسرەو کوڕی سیاوەخش کوڕی کەیکاوس

کاتێك کەیکاوس مرد، کوڕەکەی کەیخوسرەو کوڕی سیاوەخش کوڕی کەیکاووس کەدایکی وەسفافەرید (فەرەنگیس)کچی ئەفراسیاب پاشای تورکان بوو، هاتە سەر تەختی پاشایەتی ئێران زەمین. کاتێك فەرمانڕەوایی گرتە دەست، نامەی بۆ هەموو سوپاسالاران نوسی سوپاکەی خۆیان بێنە دەرگای بارگای ئەو. کاتێك کۆبوونەوە، کەرەستە و ساز وبەرگی بەسەر سی هەزار کەسدا بەخشی و بەکەرەستەکانی شەڕ تەیاری کردن و بۆ وڵاتی تورکانی ناردن و فەرماندەیی ئەوانی بەتوس سپارد. فەرمانی پێدا لەسەر زەمینی تورکان لەهیچ دێ و شارێك تێپەر نەبێت مەگەر ئەوەی هەموویان لەتیغی شمشێر بوگزەرێنێت جگە لەیەکێك لەشارەکانی کەیەکێك لەبراکانی بەناوی فیروزد (فرورد)کوڕی سیاوەخش تیایدا نیشتەجێ بوو و باوکی لەیەکێك لەشارەکانی تورکان دایکی بەهاوسەری هەڵبژاردبوو. توس بەو سوپایە لەسنوری توران تێپەری کرد و لەنێوان ئەو و فیروزد شەڕێکی قورس ڕویدا و فیروزد

لەو شەڕەدا کوژرا. کاتێك کەیخوسرەو لەئەنجامی ئەم جەنگە ئاگادار بوویەوە نامەی بۆ مامی خۆی نوسی و فەرمانی پێدا توس بگرێت و بەندی بکات و بەهەمان شێوە بۆ دەرباری بنێرێت و فەرماندەیی سوپا بگرێتە دەست. ئەو ئەم کارەی کرد و لەگەڵ سوپاکەی بۆ شەڕی ئەفراسیاب بەرێکەوت. ئەفراسیابیش لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە و بەرەو گۆڕەپانی شەڕ ڕەوانەی کرد. شەڕێکی قورس رویدا و کەسانێکی زۆر کوژران و ئێرانییەکان رویان کردە بەرزاییەکانی کوێستان و بۆ لای کەیخوسرەو گەڕانەوە. ئەو مامی خۆی سەرکۆنە و لۆمە کرد و بۆ شەڕی تورکان قۆلی هەڵکرد. فەرمانیدا هەموو سوپاییەکان کۆبکەنەوە و کەس دانەنیشێت. کاتێك هەموویان کۆبوونەوە، ئەوانی ئاگادار کردەوە دەیەوێت لەچوار لاوە هێرش بکاتە سەرزەمینی تورکان. گودەرزی لەگەڵ گەورەترین سوپا نارد و فەرمانی پێدا لەسنووری بەلخەوە هێرش بکاتە سەر توران زەمین. ئاڵای کاویانی بەکەیخوسرەو دا کەرێزدارترین ئاڵای ئێرانە. ئێرانییەکان ئەم ئاڵایەیان جگە بەدەستی دەستەیەك لەشازادەکان- ئەویش بۆ کاری زۆر گەورە- نەدەدا. سوپایەکیتری لەپانتاییەکانی چینەوە نارد و سوپایەکیتری لەسنووری خەزەر و چوارەم سوپای لەنێوان سنووری ئەم دووانەوە ڕەوانە کرد. سوپایەکان لەهەر لایکەوە هێرشیان کردە سەر توران زەمین و وێرانیان کرد. بەتایبەت گودەرز کەزۆری کوشت و زۆری بەدیل گرت. کەیخوسرەو خۆی بەدوای گودەرزدا بەرێکەوت و پێی گەشت و بینی ژمارەیەکی زۆری لەپیاوەکانی ئەفراسیاب کوشتووە و لەکوشتنی ئەوان لەئەندازە تێپەری کردووە. بینی پێنسەد وشەست و چەند هەزار کەسی کوشتووە، سی هەزاری بەدیلی گرتووە ودارایی و زێر و گەوهەر و هەموو جۆرە ساز و بەرگێکی ژیان، زیاد لەرادە و ژمارە تاڵانی کردووە. گودەرز کوژراوەکانی سوپای ئەفراسیاب و تەرخانانی نیشانی کەیخوسرەو دا و بەمەیش لەبەر چاوی پاشا زۆر گەورەبوو. پاشا سپاسی کرد و ئیسفەهان و جرجانی پێبەخشی. نامەکان لەلەشکرەکەیەوە لەهەموو شوێنەکان دەگەشت و ئاگاداریان دەکردەوە تا قولایی ولاتی تورکەکان رۆشتوونە پێش، و لەکوشتار و وێرانی و تاڵانییەکان ئاگاداریان کردەوە. نووسیبوویان: لەشکرەکانی ئەفراسیابیان یەك لەدوای یەك تێکشکاندووە. وەڵامی دانەوە: لەسەر شەڕ بەردەام بن و دواتر لەشوێنێك کەئاماژەی

پێدا، پەیوەستی بن.

کاتێك ئەفراسیاب ئاگادار بوویەوە زۆر لەکەسان و تەرخانان و سوپاکەی کوژاروە، ئەم کارەی زۆر لا گران و پەرێشان بوو. لەکورەکانی جگە لەشیدە کەس نەمابوویەوە. ئەوی بەسوپایەکەوە ردوانەی شەڕی کەیخوسرەو کرد. شیدە بۆ شەڕ بەرێکەوت و لەنێوان دوو سوپاکە شەڕێکی قورس رویدا وچوار رۆژی خایاند. تورکەکان شکستیان خوارد و ئێرانییەکان دوایان کەوتن و زۆریان کوشت و زۆریان بەدیلی گرت.ئەفراسیاب لەم کارە ئاگادار بوویەوە و هەواڵی کوژرانی کورەکەی بیست. بەو سوپایەی لەگەڵیدا بوو، بەرێکەوت و لەگەڵ کەیخوسرەو بەیەك گەشتن و شەڕێکی قورس رویدا کە هاوشێوەی نەبیستراوە و نەبینراوە. شەڕ دژوار و ئەفراسیاب شکستی خوارد. کوژراوی تورکەکان زیادی کرد بەشێوەیەك سەدهەزار کەس لەوان لەخوێنی خۆیان دەتلان. کەیخوسرەو بۆ گرتنی ئەفراسیاب هەوڵی دەدا و ئەو شار بەشار رایدەکرد تا گەشتە ئازەربایجان و لەوێ خۆی شاردەوە. دۆزییانەوە و هێنایانە لای کەیخوسرەو. کاتێك گەشتە لای کەیخوسرەو، لەبیانوی کوشتنی ناجوامێرانەی باوکی پرسی، بەڵام ئەفراسیاب پاساوی نەهێنایەوە و داوای لێبووردنی نەکرد. کەیخوسرەو فەرمانی کوشتنی دەرکرد. بەوشێوەی سیاوەخش سەری برابوو، سەریانبڕی. کەیخوسرەو سەرکەوتوو و شادمان لەئازەربایجان گەرایەوە.

کاتێك ئەفراسیاب کوژرد تورکەکان دوای ئەو براکەی کی سواسفیان بەپاشایەتی هەڵبژارد و کاتێك ئەو مرد کورەکەی گرزاسف هاتە سەرتەخت. پیاوێکی ستەمکار و گەردنکێش بوو.

کاتێك کەیخوسرەو تۆڵەی باوکی سەندەوە و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، دڵی لەدنیا هەڵکەند و پاشایەتی بەجێهێشت و رویکردە خۆپارێزی. کەسان و هاورێکانی زۆر هەوڵیاندا، جارێکیتر بیگەرێننەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی بەڵام رازی نەبوو. پێیان وت: کەسێك دوای خۆت بکەرە پاشا. ئەو لهراسبی کردە جێگری خۆی. دوای ئەوە کەیخوسرەو لێیان جیابوویەوە و خۆی داشارد و کەس نەیزانی چی بەسەرهات و کەی مرد، دەستەیەك ئەم داستانەیان بەشێوەیەکیتر گێراوەتەوە.

رۆژگاری پاشایەتی ئەو شەست ساڵ بوو و دوای ئەو لهراسب پاشایەتی گرتەدەست.

## چارەنوسی منداڵەکانی ئیسرائیل دوای سلێمان

دەڵێن: دوای سلێمان کورەکەی رەحبعەم (رەحبعام) کوڕی سلێمان بوو بەپاشای منداڵەکانی ئیسرائیل. ماوەی پاشایەتی ئەو حەفدە ساڵ بوو. دوای ئەو پاشایەتی و فەرمانرەوایی لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل بلاوبوویەوە چوونکە لەم کاتەدا سەدا کوڕی رەحبعەم لەتیرەی بنیامین و یەهودا بوو بەپاشا و هۆزەکانیتر یور بەعم کوڕی بایعا کۆیلەی سلێمانیان کردە پاشای خۆیان. ئەم کارە بەهۆی ئەو قوربانییەوە بوو جەرادە هاوسەری سلێمان – بە گومانی ئەوان– لەماڵەکەیدا پێشکەشی بتی کردبوو. لەبەر ئەمە، خوا ئاگاداری کردەوە کەپاشایەتی لەدەستەیەك لەمنداڵەکانی دەگرێتەوە. سەدا کوڕی رەحبعەم سێ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. دواتر ئەسا کوڕی سەدا فەرمانی بەسەر ئەو دوو هۆزەدا کرد کەباوکی فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکردن. ئەو چل و یەك ساڵ پاشایەتی کرد. پیاوێکی چاکەکار و شەل بوو.

## شەڕی ئەسا كوڕی سەدا لەگەڵ رزح فەرمانڕەوای هیند

دەڵێن: ئەسا كوڕی سەدا پیاوێكی چاكەكاربوو. باوكی بتی دەپەرەستی و خەڵكی بۆ بت پەرەستی هان دەدا. كاتێك كورەكەی ئەسا بوو بەپاشا، فەرمانی بەجارچییەك جار بدات: كوفر و لایەنگرانی لەناوچوون و ئیمان و باوەڕداران زیندوو مانەوە. هیچ كافرێك لەنێوان منداڵەكانی ئیسرائیل سەر هەڵناگرێت مەگەر ئەوەی بیكوژین. ئەگەر تۆفان سەراسەری دنیایی گرتەوە و خەڵكەكەی بەناو خنكان، ئەگەر زەوی دێهاتەكانی قوتتدا و ئەگەر بەرد و ئاگر لەئاسمانەوە بارین، هەموویان تەنیا نیشانەی پشت گوێ خستنی فەرمانی خواوەند و رووكردنە نافەرمانی بوو. ئەو لەم كارەدا سەختگیری دەكرد.

لەم كاتەدا دەستەیەك لەبتپەرەستەكان و گوناحكاران هاتنە لای دایكی پاشا. ئەم ژنە بتی دەپەرەستی. ئەوان شكایەتیان بردە لای ئەو و گازندەیان كرد. دایك هاتە لای كورەكەی خۆی و سەركۆنە كرد و داوای لێكرد دەست لەو كارانە هەڵگرێت. ئەو گوێی لەقسەی دایكی نەگرت، بەڵكو لەبتپەرستی ئاگاداری كردەوە و بێزاری خۆی لێدەربری. لەمكاتەدا خەڵكان لێی بێهیوابوون و كەسانێك كە لەو دەترسان، لێی جیابوونەوە و رویان كردە هیندستان.

لەهیند پاشایەك پاشایەتی دەكرد رزح (روح) یان پێدەوت. پیاوێكی ستەمكار و زاڵم و فەرمانڕەوا و زۆرینەی ئەو پانتاییە فەرمانیان لەو دەبرد. خەڵكی بۆ پەرەستیی خۆی هان دەدا. ئەو دەستە لەمناڵەكانی ئیسرائیل كە رۆشتنە لای ئەو، لەپاشاكەی خۆیان سكاڵا و وەسفی سەرزەمینەكەی خۆیان بۆ كرد كەزۆر فراوانە و خەڵكی زۆر و لەشكری كەمی هەیە و فەرمانڕەواكەی سست و ناتەوانە، بۆ گرتنی شام تەماحیان خستە بەردەم.

ئەو سیخورەكانی ڕەوانە كرد تا راپۆرتەكانی ئەو سەرزەمینەی بۆ بێنن. كاتێك لەهەواڵەكان دڵنیابوو، سوپای كۆكردەوە و لەرێگای دەریاوە بەرێكەوت. مناڵەكانی ئیسرائیل پێیان وت: ئەسا هاورێیەكی هەیە هاوكاری دەكات. رزح وتی: ئەسا و هاورێكەی لەكوێ توانای بەرگە گرتنی سوپا و لەشكرەكەی ئێمەیان هەیە!.

ئەم هەواڵە بەئەسا گەشت. ئەو رویکردە دەرگای خوای گەورە و پاڕایەوە و سستی و لاوازی خۆی لەبەرابەر هیندیەکان ئاشکرا کرد و داوای هاوکاری کرد. خوا وەڵامی داواکارییەکەی دایەوە و لەخەودا بەم شێوەی پێفەرموو: هێز و توانایەکی ئەوتۆ لەهێزی خۆم لەبەرابەر سوپاکەی رزح لەخۆم نیشان دەدەم کەزیانی ئەوان لەتۆ دوور بکەمەوە و سامانەکانی ئەوان وەك تاڵانی بە تۆ دەبەخشم تا دوژمنەکانیشت بزانن هاورێکەی تۆ سەرکوت ناکرێت و سوپاکەی هیچ کات گیرۆدەی شکەست نابن.

رزح بەرێکەوت و لەدەریا لەنگەری گرت وبەرەو بیت المقدس رۆشت. کاتێك گەشت، سوپاکەی لەهەر لایکەوەنارد. ئەو سەرزەمینە بەتەواوی کەوتە ژێر قاچی سوپاکەی و دڵی منداڵەکانی ئیسرائیلیەکان لێوانلێو بوو لەترس. ئەسا سیخورەکانی نارد. گەڕانەوە و هەواڵیان بۆ هێنا کەلەشکرییەکانی زەرح ئەوەندە فراوانن تا ئێستا کەس هاوشێوەی نەبیستووە. منداڵەکانی ئیسرائیل ئەم هەواڵانەیان بیست و دەستیان بە شین و رۆڕۆ کرد و گریان و ماڵئاواییان لەیەك کرد. ویستیان برۆنە لای زەرح و خۆیان تەسلیم بکەن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بن. پاشا بەوانی وت: خوا موژدەی سەرکەوتنی بەمن داوە و موژدەی ئەو هیچ کات ناراست نییە. بگەڕێنەوە و لەدرگای خوا بپاڕێنەوە. هەموویان گەڕانەوە ولەخوا پاڕانەوە. گومانیان برد خوا بەمشێوە وحی بەو پاشایە کردووە: ئەی ئەسا هاورێ هیچ کات هاورێکەی خۆی بە تەنیا جێناهێڵێت و من زیانی دوژمنەکانت لەتۆ دوور دەکەمەوە چوونکە هەر کەس کارەکانی خۆی بەمن بسپێرێت سوك و ریسوا نابێت و کەسێك هێز لەمن وەربگرێت، سست نابێت. تۆ لەکاتی فراوانیدا لەبیری مندا بوویت و ئێستا لەتەنگانەدا جێت ناهێڵم. هەنووکە فریشتە ئەشکەنجەگەرەکانی خۆم دەنێرم تا دوژمنەکانم لەناو ببەن. پاشا لەم وەحییە شادمان و منداڵەکانی ئیسرائیلی ئاگادار کردەوە. باوەڕداران شادمان بوون و دوو ڕووەکان بەدرۆزنیان زانی.

حوا فەرمووی بەسوپاکەی خۆی بڕواتە شەری زەرح و سوپاکەی. ئەو بەژمارەیەکی کەمەوە رۆشتەدەر و ئەوان رۆشتنە سەر بەرزاییەکان و لەشکرە فراوانەکەی زەرح یان بینی. کاتێك زەرح ئەوانی بینی، بەهیچ و کەمی زانین و وتی: لەم وڵاتەکەم هاتمەدەر و سوپاکەم کۆکردەوە و داراییەکانم هەزینە کرد تا چاوم بەژمارە کەمە

بکەوێت! ئەو، ئەو دەستە لەمناڵەکانی ئیسرائیل کە ڕۆشتبوونە لای، لەگەڵ ئەو سیخوڕانەی ناردبوونی تا ئاگاداری بارودۆخی بکەنەوە، بانگ کرد و وتی: درۆتان کرد و بەمنتان وت ژمارەی مناڵەکانی ئیسرائیل زۆرە. دواتر فەرمانیدا ئەوان بکوژن. بۆ ئەسا پەیامی نارد: هاورێکەی تۆ لەکوێیە تا هاوکاریت بکات ولەزیانی من دوورت بکاتەوە؟ ئەسا وەلامی دایەوە: ئەی بەدبەخت، تۆ نازانیت چی دەڵێیت. ئایا دەتەوێت بەهێزی خۆت بەسەر خوادا سەرکەویت یا بەژمارەی کەمی سوپاکەت لەبەرابەر سوپای بێ ئەژماری فریشتەکان سەرکەوتن بەدەست بێنیت؟ ئەو لێرە لەگەڵ منە. کەسێك خوای لەگەڵدا بێت شکەست ناخوات و تۆ بەزوویی دەبینی چیت بەسەر دێت.

زەرح لەوتەکەی تووڕە بوو، سوپاکەی خۆی ئامادە کرد و ڕویکردە شەڕی ئەسا. فەرمانی بەتیرهاوێژەکانیدا لەشکرەکەی ئەسا تیرباران بکەن. خوا فریشتەکانی بۆ هاوکاری مناڵەکانی ئیسرائیل نارد کەیەك یەك تیرەکانیان هەڵگرت و بۆ هیندیەکانیان هاویشت. هەر تیرێك بیاوێکی کوشت و تیرهاوێژەکان هەموویان کەوتنە سەر خاك. مناڵەکانی ئیسرائیل هاواری شادییان بەرز کردەوە و سپاسی خوایان کرد. دواتر فریشتەکان لەبەرابەر هیندیەکان دەرکەوتن و کاتێك زەرح ئەوانی بینی، خوا ترسی خستە دڵەوە. ئەو سەرلێشێواو فەرمانی هێرش کردنی بەسوپاکەیدا. ئەوان هێرشیان برد بەلام فریشتەکان یەك یەك ئەوانیان گرت و کوشتیانن و جگە لەزەرح و ژنەکان و کەنیزەکانی کەس نەمایەوە. کاتێك ئەمەی بینی مەبەستی هەلاتنی کرد و وتی: هاورێکەی ئەسا ئێمەی لەناو برد.

کاتێك ئەسا بینی ڕادەکات، وتی: خوایە، ئەگەر تۆ لەناوی نەبەیت، جێگرەکەی بۆ شەڕی ئێمە دەنێرێت. زەرح و هاورێکانی گەشتنە دەریا و سوار کەشتی بوون. کاتێك کەشتی بەرێکەوت، خوا بایەکی هەڵکرد و هەموویانی لەناو برد.

دوای ئەسا کوڕەکەی سافات بۆ بیست و پێنج ساڵ پاشایەتی کرد و دواتر لەناوچوو. دوای ئەو عەزلیا کچی عەمردم برای ئەخزیا بەپاشایی گەشت. ئەو هەموو شازادەکانی مناڵەکانی ئیسرائیلی کوشت جگە یواش کوڕی ئەخزیا کوڕی کوڕەکەی

خۆی چوونکه ئەمەیان لێ شاردەوە. دواتر یوشا و هاورێکانی ئەویان کوشت. ئەو حەوت ساڵ پاشایەتی کرد. دوای ئەو یواش بۆ ماوەی چل ساڵ لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و لەکۆتاییدا بەدەست هاورێکانی کوژرا. ئەو بوو دایەگەورێی خۆی کوشتبوو. دوای ئەو عوزیا کوڕی ئەمسیا کوڕی یواش بوو بەپاشا و ئەمە ئەو کەسەیە غوزیای پێدەڵێن. ئەو تا کاتی مردنی پاشایەتی کرد و رۆژگاری پاشایەتی ئەو پەنجاو و دوو ساڵی خایاند. دوای ئەو یوسام کوڕی عوزیا تاسەردەمی مەرگ بۆ ماوەی شانزە ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. ئەوسا حزقیا کوڕی ئەحاز تا مردن پاشایەتی کرد. دەڵێن: ئەو هاو رۆژگاری شوعیا بوو کە لەکۆتایی ژیانی خۆی ئاگاداریان کردەوە و لەخوا پاڕایەوە و خوا تەمەنی درێژ کرد و شوعیا فەرمانی پێدرا ئاگاداری بکاتەوە. دەستەیەکیتر دەڵێن: هاورۆژگاری شوعیا لەم داستانەدا، بەسدقیا ناودەبرا. دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

## داستانی شوعیایی پێغەمبەر (د.خ) و پاشاکانی رۆژگاری ئەو لەمناڵەکانی ئیسرائیل و رەوانە کردنی سەنحاریب بۆ لای ئیسرائیلیەکان

دەڵێن: خوای گەورە، بابەتێکی بۆ موسا ڕەوانە کرد و لەقورئاندا ئاماژەی پێدراوە. خوا فەرمووی: لەنامەکەی خۆم پەیامەکەم بەمناڵەکانی ئیسرائیل دا کە بێ گومان دووجار لەسەر زەوی خراپەکاری دەکەن و دواتر رزگارتان دەبێت، رزگاربوونیکی تایبەت. کاتێك کاتی یەکەم هات لەو دووانە، بۆ ئێوە بەندەکان لەخۆمان دەنێرین بەهێز کە لەناو ماڵەکاندا دەگەرێن و بەدواتانا دێن و ئەمە خۆی موژدەیەکە. ئەوسا شوێن بەزیانی ئێوە دەسپێرین و ئێوە مناڵ و سامانی فراوانتان پێدەبەخشین و سوپاکەتان لەوەی زیاتر بوو زیاتر دەکەین. ئەگەر چاکە بکەن، لەسودی خۆتان دەیکەن و ئەگەر خراپە بکەن لەزیانی خۆتان. کاتێك کاتی سزادانی خراپەکاری یەکەم هات، لەروخساری ئێوە خەم دروست دەکەن و دەرۆنە مزگەوت تا ئەو شوێنەی دەتوانن وێرانی دەکەن. خوا دەیەوێت بەئێوەی ببەخشێت و ئەگەر بگەرێنەوە، دەگەرێینەوە. و دۆزەخمان بۆ ناسپاسان کردە زیندانێکی جاویدان( مناڵەکانی ئیسرائیل /١٧/٤-٧).

دەڵێن: گوناح و روداوە ناخۆشەکان لەمناڵەکانی ئیسرائیل روی لەزیاد بوون کرد و خوا لەو خۆشەویستیەیی بەرابەر بەوانی بوو، خۆش دەبوو، یەکەم سزا خوا بەسەریاندا دایباراند، لەرۆژگاری پاشایەك لەوان بە ناوی سدقیە بوو. کاتێك یەکێك لەوان بەپاشایەتی دەگەشت، خوا پێغەمبەرێکی بۆ دەنارد کەرێنویی دەکرد و ئەوەی دەیوەیست وەحی پێدەکرد. ئەوان ناییینێکیان جگە لەتەورات نەبوو. کاتێك سدقیە بوو بەپاشا، خوای گەورە شوعیای بۆ نارد. ئەو کەسە بوو مژدەی هاتنی عیسی و محمدی هێنا. کاتێك ویستی پاشایەتییەکەی کۆتایی بێت، روداوە ناخۆشەکان لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل زیادی کرد و خوا سەنحاریب پاشای بابلی بەسوپایەکی زۆر ناردە

سەر منداڵەكانی ئیسرائیل كە زەوی و ئاسمانیان پڕدەكرد. ئەوهات و لەبیت المقدس خێوەتی هەڵدا و گەمارۆی خستە سەر. پاشای منداڵەكانی ئیسرائیل نەخۆش و برینێك لە قاچیدا دروست ببوو. شوعیای پێغەمبەر(د.خ) هات و پێی وت: وەسیەتی خۆت بكە چوونكە بەزوویی دەمریت. پاشا دەستی بەپاڕانەوە و پەرەستین كرد. خوا داواكارییەكەی وەلأم دایەوە و وەحی بەشوعیا كرد كەتەمەنی پاشامان پانزە ساڵ درێژ كردەوە و ئەومان لەدەستی دوژمنەكەی سەنحاریب رزگار كرد. كاتێك شوعیا پەیامی دانا، ئازاری پاشا كۆتایی پێهات و باش بوویەوە.

خوا فریشتەیەكی ناردە سەر سوپاكەی سەنحاریب. بەسەر ئەواندا ڤیژاندی و لەزیانەكەی هەموویان مردن جگە لەشەش كەس كەیەكیان سەنحاریب خۆی بوو و ئەوانیتر لەراوێژكارەكانی بوون. دەستەیەك دەڵێن: یەكێك لەوان بخت النسر بوو. سدقیە لەگەڵ منداڵەكانی ئیسرائیل رۆشتنە ئوردوگاكەی ئەوان و هەموو سامان و داراییەكەی ئەوانیان تالأن كرد و بۆ دۆزینەوەی سەنحاریب بەرێكەوتن و ئەو و هاورێكانیان دۆزییەوە. ئەویان گرت و بەندیان كرد و هێنایانە لای پاشا. ئەو بەسەنحاریبی وت: هەڵس وكەوتی خوات لەگەڵ ئێمەدا چۆن بینی؟ وتی: هەواڵی كاری خواوەندەكەتانیان بۆ من هێنا و هاوكاری ئەویان بەمن وت بەلأم گوێم لێنەگرت. ئەوانی لە بیت المقدس دا سووڕاندەوە و دواتر زیندانی كردن.

خوا وەحی بۆ شوعیا ڕەوانە كرد تا پاشا فەرمانی ئازاد كردنی سەنحاریب و هاورێكانی بدات. ئەو ئەوانی ئازاد كرد و بۆ بابل گەڕانەوە و بۆ خەڵكەكەی خۆیان گێڕایەوە كە خوا چ بەلأیەكی بەسەر خۆیان و سوپاكەیاندا هێناوە. سەنحاریب حەوت ساڵ دوای ئەو رووداوە مایەوە و دواتر مرد.

دەستەیەك لەزاناكانی ئەهلی كتێب گومان دەكەن پێش سەنحاریب، یەكێك لەپاشاكانی بابل هێرشی كردە سەر منداڵەكانی ئیسرائیل كەپێیان دەوت كفرۆ(كیفۆ). بخت النسر كوڕە مام و راوێژكاری ئەو بوو. خوا بایەكی بۆ ناردن و هەموویانی لەناو برد و ئەو و راوێژكارەكەی رزگاریان بوو. ئەم بابلیە بەدەستی یەكێك لەكوڕەكانی كوژرا. بخت النصر لەم كوشتنی پاشا توڕە و بكوژەكەی كوشت. سەنحاریب دوای ئەو

بەرێکەوت و پایتەختەکەی نەینەوا بوو. ئەو رۆشت و هاورێ لەگەڵ پاشاکەی ئەو رۆژەی ئازدربایجان هێرشی کردە سەر منالّەکانی ئیسرائیل و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. دواتر لەنێوانی سەنحاریب و پاشای ئازەربایجان شەڕ و شوڕ کەوتەوە بەشێوەیەك لەشکرەکانیان لەناوچوون. منالّەکانی ئیسرائیل رۆشتنە دەر و سامانی هەردوو سوپاکەیان تالآن کرد.

دەستەیەك دەڵێن: رۆژگاری پاشایەتی تا مردنی سەنحاریب بیست و نۆ ساڵ بوو. ئەو پاشایەی سەنحاریب گەمارۆی دا بەحەزقیا ناو دەبرا. کاتێك حەزقیا مرد کوردکەی بۆ ماوەی پەنجا و پێنج ساڵ پاشایەتی کرد. دوای ئەو ئامون هاتەسەر کار تا هاورێکانی کوشتیان و دوانزە ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. بە دوای ئەودا کورەکەی یوشا بوو بەپاشا کەفیرعەونی اجدعە(لوت براو)،خوێنی رشت و سی و یەك ساڵ پاشایەتی کرد. دواتر کورەکەی یاهواحاز کوڕی یوشا هاتە سەر تەخت کە فیرعەونی لوت براو لەسەر کار لایبرد و یویاقیم کوڕی یاهواحازی لەجێگەی دانیشاند و باجێکی لەسەر دانا تا بەردەام بۆی بنێرێت. ماوەی پاشایەتی ئەو دوانزە ساڵ بوو. دوای ئەو کورەکەی یویاحین بوو بەپاشا کە بخت النسر شەڕی لەگەڵدا کرد و سێ مانگ دوای بوون بەپاشا ئەوی بۆ بابل نارد. لەدوای ئەو کورە مامەکەی یقونیای بەپاشایەتی هەڵبژارد و ناوی نا سدقیە. سدقیە لەگەڵیدا ناسازگار بوو. بخت النسر شەڕی لەگەڵدا کرد و بەسەریدا سەرکەوت و بردییە بابل و دو کوڕەکەی لەبەر چاویا سەربڕی و شیشی لەچاودکانی کرد و بیت المقدس و پەیکەرەکەی لەناو برد. ئەو منالّەکانی ئیسرائیلی بەدیلی بردە بابل. ئەوان مانەوە تا کاتی گەڕانەوەیان بۆ ئەو سەرزەمینە و بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین. هەمووروۆژگاری پاشایەتی سدقیە یانزە ساڵ بوو.

دەستەیەك دەڵێن: خوا وەحی بەشوعیا کرد بڕواتە ناو منالّەکانی ئیسرائیل و بۆ خواپەرستی هانیان بدات( یا خویان بیر بخاتەوە) و ئەوی دەیخاتە سەر زمانی ئەو، ئەوانی لێ ئاگادار بکاتەوە چوونکە گوناح و کارەناشیرین و ڤێزەونەکان لەناو منالّەکانی ئیسرائیل زیادی کردبوو. ئەو ئەم کارەی کرد بەلأم مەبەستی کوشتنیان کرد. رایکرد و پەنای بردە بەردارێك. دارەکە کرایەوە و رۆشتە ناو دارەکە بەلأم دێو

داوێنی كراسەكەی گرت و نیشانی ئسرائیلیەكانی دا. ئەوان مشاریان خستە سەر دارەكە و بەپێغەمبەرەوە لە سەرەوە بۆ خوارەوە كردییانە دوولەت.

لەبارەی پاشاكانی ئەوان شتیتریشیان ئاماژە پێداوە كەئێمە پشت گوێمان خست تادرێژدادڕی نەكەین و لە لایەكیتر لەگێرانەوەكان دڵنیا نەبووین.

## پاشایەتی لهراسب و کورەکەی بشتاسب و دەرکەوتنی زەردەشت

پێشتر وتمان کاتێك سەردەمی مردنی کەیخوسرەو هات، دوای خۆی کورە مامەکەی لهراسب کوڕی کیوخی کوڕی کەیکاوسی بۆ پاشایەتی هەڵبژارد. لهراسب کوڕی کوڕی کەیکاووسە. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست تەختێکی زێڕینی دروست کرد و بەجۆرەها گەوهەری گرانبایی رازاندییەوە. لەسەرزەمینی خوراسان شاری بەلخیان بۆ دروست کرد و ناوی نا (زیبا شار). ئەو دەبیرخانەی جیاوازی دروست کرد و بۆ سەرپەرەستی کردنی هەرکام دەبیرێکی دانا. پاشایەتی ئەو بەهەڵبژاردنی سەربازەکان بەهێزبوو. زەوی ئاوەدان کردەوە و بۆ رۆژی سوپاکەی باجی خستەسەر خەڵك.

شکۆمەندی تورکەکان لەرۆژگاری ئەودابوو. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی هاتە شاری بەلخ تاشەڕیان لەگەڵدا بکات و.زاری شەڕ بدۆڕێنێت.
ئەو لەناو هاولاتیانی خۆی پیاوێکی چاکەکار و دڵپەسەند بوو. دراوسێ دوژمنەکانی خۆی بەسەختی سەرکوتی دەکرد و هاورێکانی خۆی باش هەڵدەسەنگاند، ورەیەکی بەرز و پەیکەرێکی ئەستوری بوو. چەندین روباری دروست کرد و چەندین شاری ئاوەدان کرد و پاشاکانی هیند و رۆم رۆژئاوا باجیان بۆ دەرباری ئەو دەنارد و لە ترسی ئەو نامەیان بۆ نوسی و بەشای شاکان ناویان برد.
دواتر پاشایەتی بەجێهێشت و بوو بە خۆپارێزێکی لەخواترس و کوڕەکەی بشتاسبی بۆ پاشایەتی کردە جێگری خۆی. رۆژگاری پاشایەتی ئەو سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا.

دوای ئەو کورەکەی بشتاسب هاتەسەر کار و لەرۆژگاری ئەو زەردەشتی کوڕی سەفیمان (زەردەشت کوڕی سپیتمان) دەرکەوت و بانگەشەی پێغەمبەری کرد و ئاگرپەرەستەکان شوێنی کەوتن. بەگومانی خاوەن کتێبەکان زەردەشت خەڵکی فەلەستین و خزمەتی یەکێك لەقوتابیەکانی ئەرمیای پێغەمبەری دەکرد و هاورێی تایبەتی ئەو بوو. دواتر خیانەتی لێکرد و درۆی بۆ هەڵبەست. ئەو شاگردە گلەیی

بردە لای خوا و ئەو گرفتاری پیسی بوو و رویکردە سەرزەمینی ئازەربایجان و لەوێ بناغەی ئایینی زەردەشتی دانا.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئێرانی بوو و كتێبێكی نوسی و لەگەڵ ئەو كتێبە سەراسەری زەوی گەرا و كەس لەماناكەی نەگەشت. گومانی دەبرد نوسراوەكەی بەزمانی ئاسمانییە كەخوای پاك قسەی لەگەڵدا كردووە. ئەو كتێبەكەی خۆی ناونا ئەشتا (ئاڤیستا) و لەئازەربایجانەوە بەرەو ئێران بەرێكەوت بەڵام ئێرانییەكان لەماناكەی نەگەشتن وپێی رازی نەبوون. ئەو رۆشت بۆ هیندستان و كتێبەكەی بردە لای پاشاكانیان و دواتر رۆشتە چین و توركستان بەڵام كەس پێی رازی نەبوو و هەمووان ئەویان لەوڵاتەكەیان دەركرد. ئەوكات ویستی بڕواتە لای فیرعەونەكان و پاشاكەیان ویستی بیكوژێت و زەردەشت رویكردە بشتاسب كوڕی لهراسب كە ئەو خستیە زیندانەوە و ماوەیەك لەزینداندا بوو. زەردەشت كوڕی سپیتمان شیكردنەوەیەكی لەسەر كتێبەكەی خۆی بە ناوی زەند نوسی و ئەوسا بەكتێبێكیتر شی كردەوە و ناوی نا پاشكۆی زەند كە بەمانای شیكردنەوەی شیكردنەوەیە چوونكە زەند بەمانای شیكردنەوە دێت. لەم كتێبەدا زانستە جۆراوجۆرەكان وەك ریازی، ئەستێرەناسی، پزیشكی و زانستیتر هەیە. بەشێك لەنوسراوەكانی بەمشێوەیە: بەوەی نێوەی پێ فەرمان دەدەم تێكەڵ بن تا پیاوێك لەسەر وشتری سوور لەسەر هەزار و شەشسەد ساڵ بێتە لای ئێوە. مەبەستەكەی لەم پیاوە پێغەمبەری ئێمە محمدە. لێرەوە لەنێوان ئێرانی و نائێرانییەكان دوژمنی دروست بوو. دواتر لەگێڕانەوەی بەسەرهاتی شاپوری شان قەڵشاو ئاماژەی پێدەدرێت كەیەكێك لەهۆكارەكانی شەڕ كردن لەگەڵ نائێرانییەكان ئەم قسە بووە. و خوا زاناترە.

دواتر بشتاسب فەرماندیا و زەردەشتیان هێنا و ئەو لەبەلخ بوو. كاتێك هاتە لای پاشا ئایینەكەی خۆی بۆ باس كرد و پاشا زۆر بە پیرۆزی زانی و شوێنی كەوت و خەڵكی بەزۆر ناچار كرد باوەڕی پێبێنن و ژمارەیەكی زۆری لەوان كوشت تاپێی رازی بوون و لەئەنجامدا سەری كورنوشیان دانەواند.

ئاگرپەرستەکان گومان دەکەن ئەژادی ئەو لەئازەربایجانە. ئەو لەبانی هەیوان هاتە لای پاشا و لەدەستیدا مشتێك ئاگربوو. گەمەی پێدەکرد بێ ئەوەی دەستی بسووتێت. هەرکەس لەدەستی وەردەگرت هەستی بە سوتان نەدەکرد. پاشا شوێنی کەوت و بووە فەرمانبرداری ئایینەکەی و ئاتەشکەدەکانی لەسەراسەری ولاتدا دروست کرد و لەو ئاگرە لەناو ئاتەشکەدەکان ئاگری دایساند. ئەوان گومان دەکەن، ئەو ئاگرانەی تا ئێستا لە ناو ئاگردانەکانیانە، لەو ئاگرەیە.
ئەمانە درۆ دەکەن چوونکە پێغەمبەر(د.خ) لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردرا، هەموو ئاگرەکان – لەناو ئەوانیش ئاگری ئاگرپەرستەکانیش– کوژایەوە و ئەمە لەشوێنی خۆیدا ئاماژە پێدەدەین بەخواستی خوای گەورە.[1]

دەرکەوتنی زەردەشت کوڕی سپیتمان سی ساڵ دوای دەسپێکردنی پاشایەتی بشتاسب بوو. ئەو بۆ پاشا کتێبێکی هێنا کە گومانی دەکرد وەحی خوای گەورەیە. ئەم کتێبەیان لەپێستی دوانزە هەزار مانگادا نوسییەوە یا بەناوی زێر نوسیان. بشتاسب لەشوێنێکی شاری ئیستەخر شاردییەوە و فەرموی رێگە نەدەن لەبەردەستی خەڵکاندا بێت.

بشتاسب و باوکانی شوێنکەوتەی ئایینی سائیبی بوون. بەسەرهاتەکانیتری لەشوێنی خۆیدا ئاماژە پێدەدەین.

---

[1] ((گێرانەوەی کوڕی اثیر لەم رووداوانە پڕە لەدەمارگیری و پەرێشانی. شیاو نییە بۆ کەسێکی وەك نوسەر لەبارەی نەیارانی خۆی بەم شێوە قسە بکات. ژیان و ئامۆژگارییەکانی زەردەشت رونتر لەوەیە تەپ و تۆزی ئەم ئەفسانەی لەسەر بنیشێت. قورئانیش بەنیشاردیەکی ئاسك، تارادەیەك ئایینی زەردەشتی بەیەکێك لەئایینە ئاسمانی و ڕاستەکان داناوە و لایەنگرانی بەمەرجی پێویست لەرزگاربووان هەژمار کردووە (حج/٢٢/١٧). وەرگێر))

# داستانی رۆشتنی بخت النصر بۆ سەرزەمینی منالەکانی ئیسرائیل

زاناکان لەبارەی کاتێك بخت النصریان بۆ سەر ئیسرائیلیەکان نارد، بەجیاوازی قسەیان کردووە. دەستەیەك دەڵێن: ئەم رووداوە لەسەردەمی ئەرمیای پێغەمبەر و دانیال و حەنانیا و عەزاریا و میشاییل (میلساییل) بووە. دەستەیەکیش دەڵێن: خوا لەبەر ئەوە ئەوی بۆسەر منالەکانی ئیسرائیل نارد چوونکە یەحیا کوڕی زەکەریاییان کوشتبوو. بێژەرانی وتاری یەکەم زیاترن.

دەسپێکی کاری بەمشێوەیە کەسەعید کوڕی جوبەیر ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: پیاوێك لەمنالەکانی ئیسرائیل کتێبی دەخوێندەوە و کاتێك گەشتە ئەم وتەی خوای گەورە کەدەفەرمێت: بەندەکانی سەختگیر و دەمارگیری خۆم بۆ سەر ئێوە ئیسرائیلیەکان دەنێرم( منالەکانی ئیسرائیل /٤/١٧). وتی: خواوەندا، ئەم پیاوە نیشانی من بدە کە لەناوبردنی ئیسرائیل بە دەستی ئەو ئەنجام دەدەیت. لەخەودا، پیاوێکی هەژاریان نیشاندا کە لەبابل دەژیا و پێیان دەوت بخت النصر. ئەو لەرێگای بازرگانییەوە بەرەو بابل کەوتە رێ و هەژارانی کۆدەکردەوە و لە بخت النسری دەپرسی. سەرئەنجام ئەویان بردە لای بخت النسر. ئەو بەدوای بخت النسری نارد. هێنایان و بینی سوالکەرێکی نەخۆشە. ئەو لای بخت النسر مایەوە و دەرمانی کرد تا چاك بوویەوە. کاتێك لەنەخۆشی هەستایەوە و ویستی سەفەر بکات، بخت النسر بەگریانەوە پێی وت: تۆ باشەی زۆرت لەگەڵ مندا کرد و من توانای پاداشت دانەوەی تۆم نییە! ئەو پیاوە ئیسرائیلیە وتی: دەتوانیت پاداشت بدەیتەوە. نامەیەك بنووسە ئەگەر بەپاشایەتی گەشتیت، ئازادم کەیت و زیانم پێنەگەیەنیت. بخت النسر وتی: ئایا گاڵتەم پێدەکەیت؟ ئیسرائیلی وتی: ئەو رۆژە بەناچاری دێت.

پاشای ئێران ویستی لەبارودۆخی شام ئاگادر ببێتەوە. پیاوێك بڕواپێکراوی خۆی نارد تا هەواڵەکانی ئەو سەرزەمینەی بۆ بهێنێت و ئاگادار بێت لەوەی خەڵکی ئەوێ چۆن رۆژگار بەسەر دەبەن. پیاو رۆشت و بخت النیر کەسوالکەرێکی هەژار بوو تەنیا بۆ خزمەت کردن دوای کەوت. کاتێك هاتە شام، سەرزەمینێکی بینی کەزیاتر لەهەموو شوێنەکان ئەسب و پیاوی شەڕکەر و کەرەستەی نیزامی جۆراوجۆری هەیە. ئەم

دیمەنە گێژ و پەرێشانی کرد و ئەو لەهیچی نەپرسی. بخت النسر دەرۆشتە ناو کۆری شامییەکان و دادەنیشت و بەوانی دەوت: ئێوە چی رێگریتان لێدەکات هێرش بکەنە سەر بابل؟ ئەگەر هێرشی بکەنە سەر، ماڵێك نابێت شتێکی لێ بەدەست نەهێنن. هەموویان وتبان: ئێمە شەرکردن بەباشی نازانین و بەدوای شەڕەوە نین. کاتێك گەڕانەوە، پێشرەوانیان لەپیاوانی شەڕکەر و ئەسب و کەرەستە نیزامیەکان ئاگادار کردەوە. بخت النسر کەسی بۆ لای پاشا نارد و خوازیاری بینینی بوو تا بارودۆخەکەی بۆ رون بکاتەوە. پاشا بانگی کرد و بخت النسر هەموو هەواڵەکانی بۆ باس کرد. دواتر پاشا بڕیاریدا لەشکرێك کۆبکاتەوە لەچوار هەزار پیاوی شەڕکەری سوارکار و ڕەوانەی شامی بکات. ئەو لەگەڵ کەسەکانی خۆی گفتوگۆی کرد تا یەکێك بکاتە فەرماندەی ئەوان. یەکێك لەهاورێکانی ئەویان دیاری کرد. پاشا وتی: ئەو پەسەند ناکەم. ئەم کارە تەنیا بەبخت النسر دەکرێت. ئەوی کردە پاشای ئەوان و بەرێکەوتن. تالآنی زۆریان کۆکردەوە و هەندێ لەشارەکانیان وێران کرد و تەندروست گەڕانەوە.

دواتر لهراسب ئەوی وەك سوپاسالاری ناوچەکانی نێوان ئەهواز تا سەرزەوینی رۆم لەرۆژئاوای دیجلە دەستنیشان کرد. هۆکاری رۆشتن و هێرش کردنە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ ئەو ئەمە بوو: کاتێك لهراسب ئەوی هەڵبژارد (ئاماژەمان پێدا) و رۆشتە شام، خەڵکی دیمەشق و بیت المقدس پەیمانی ئاشتیان لەگەڵدا بەست. ئەو بارمتەی زۆری لێگرتن و گەڕایەوە. کاتێك لە قودس ەوە رۆشتە ناو تەبەرییە منداڵەکانی ئیسرائیل شۆرشیان کرد و یاخی بوون و دەستیان بەشەڕ لەگەڵ ئەو پاشایە کرد کەپەیمانی ئاشتی لەگەڵ بخت النسر مۆر کردبوو. ویستیان بیکوژن و وتیان: لەگەڵ خەڵکی بابل بەنەرمی هەڵس و کەوتت کرد و ئێمەت سوك و ریسوا کرد. کاتێك بخت النسر ئەمەی بیست، ئەو بارمتانەی لای بوون کوشتی و بۆ قودس گەڕایەوە و وێرانی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی بخت النسری خستە سەر کار، بەهمەن کوڕی بشتاسب کوڕی لهراسب بوو. بخت النسر خزمەتی باوك وباوەگەورێ و خودی ئەوی کردبوو و تەمەنی درێژی پێبڕابوو. بەهمەن کەسانێکی بۆ بیت المقدس بۆ لای پاشای منداڵەکانی

نیسرائیل نارد و ئەو پیاوە نیسرائیلیە ئەوانی کوشت. بەهەمەن لەم کارە توورە و بەبخت النسر فەرمانرەوایی هەرێمەکانی بابلی بەخشی و ئەوی بەسوپایەکی زۆرەوە نارد و ئەو کارەی کرد کەئاماژەی پێدەدەین.

ئەمانە هۆکاری دەرەکیەکان بوون بەڵام هۆکاری سەرەکی و بنچینەیی کەئەم بزوێنەرانەی دروست کرد و بووە هۆی رق لەمناڵەکانی نیسرائیل ، نافەرمانی و گوناح لەبەرابەر خوای گەورە و خۆ دوور خستنەوە لەفەرمانەکانی ئەو بوو. چۆنییەتی هەڵس و کەوتی خوا لەگەڵ مناڵەکانی نیسرائیل بەم شێوە بوو کاتێك یەکێکی دەکردە پاشای ئەوان، پێغەمبەرێکیشی بۆ دەنارد تا رێنوێنی بکات و فەرمانەکانی تەوراتی فێربکات. پێش هێرش کردنی بخت النسر بۆ سەر ئەوان، روداوە ناخۆش و گوناحەکان لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل روو لەزیاد بوون بوو. پاشاکەیان یقونیا کوڕی یویاقیم بوو. خوا ئەرمیایی وەك پێغەمبەربۆ نارد کەدەستەیەك دەڵێن هەمان خزرە. ئەو لەناو ئەواندا مایەوە و بۆ کاری چاکە هانی دەدان و لەکارە قێزەون و ناشیرینەکان دووری دەخستنەوە و سەنجاریبی بیر دەهێنانەوە. ئەوان نەگەڕانەوە بۆ سەر رێگای راست. خوا فەرمانی پێدا ئەوان لەهەڕەشە و سزای خوایی ئاگاداربکاتەوە و بڵێت ئەگەر بۆ فەرمانی خوا نەگەرێنەوە، کەسێکیان دەنێرێتە سەر کەکوشتاریان دەکات، دەیانکاتە کۆیلە وبەسوپاکەی هێرشیان دەکاتەسەرکەنرمی و خۆشەویستی لەدڵی پاك دەکاتەوە. ئەوان بۆ رێگای خوا نەگەڕانەوە و خوا پەیامی پێدا: بێ گومان ئاژاوەیەکیان بۆ دەنێمەوە کە زانا و فرەزان سەرگەردان بکات و باوەڕی باوەڕداران و فرمزانی زاناکان بسرێتەوە. بێ گومان دڵرەقێك و ستەمکارێکیان بەسەریاندا زاڵ دەکەم و جلی ترساندی لەبەر دەکەم و خۆشەویستی لەدڵ دەسڕمەوە. لەگەڵ ئەودا سوپایەك هاوشێوەی شەو تاریك بن و لەشکرێك وەك هەورێ چڕ، هاورێیەتی بکەن. ئەو مناڵەکانی نیسرائیل لەناو بەرێت و رقیان لەدڵدا پەروەردە بکات و بیت المقدس وێران بکات.

کاتێك ئەرمیا ئەمەی بیست قیژاندی، گریا وجلی دڕاند و خۆڵەمیشی کرد بەسەردا و لەخوا پاڕایەوە تا ئەم رقەی خواییە لەرۆژگاری ئەو دوور بخاتەوە.

خوا وەحی پێکرد: سوێند بەگەورەیی خۆم بیت المقدس وێران ناکەم و مناڵەکانی

منداڵەکانی ئیسرائیل لەناو نابەم تا لەتۆوە بۆ ئەم کارە فەرمانێك بێت. ئەرمیا شادمان بوو و وتی: سوێند بەو کەسەی موسا و پێغەمبەرەکانیتری بەراستی هەڵبژارد، هەرگیز فەرمانی لەناوچوونی منداڵەکانی ئیسرائیل نادەم.

ئەرمیا هاتە لای پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل و لەوەی وەحی پێکرابوو، ئاگاداری کردەوە. پاشا شادمان بوو. ئەوان دوای ئەمە سێ ساڵ مانەوە و جگە لەتاوان و خراپەکاری هیچیتریان نەکرد لەکاتێکدا سەردەمی مەرگ و لەناوچوونیان نزیك ببوویەوە. چیتر وەحی نەدەهاتە خوار چوونکە وانەیان وەرنەدەگرت. پاشاکەیان پێیانی وت: ئەی منداڵەکانی ئیسرائیل دوای ئەوەی ئەشکەنجەی خواییتان بەسەرداباری، لەوەی هەن و دەیکەن، دەگەڕێنەوە و خۆپارێزی دەکەن. ئەوان وانەیان وەرنەگرت. خوا خستیە دڵی بخت النسر تا بەرەو منداڵەکانی ئیسرائیل لەبیت المقدس بڕوات و ئەو بە سوپایەکی زۆر کە هەوایان پڕدەکرد، بەرێکەوت.

پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل ئەمە هەواڵەی بیست و ئەرمیای پێغەمبەری بانگ کرد، وتی: کوا ئەو موژدەی خواکەت کە گومانت دەبرد تا تۆ فەرمان نەدەیت، بیت المقدس وێران نابێت؟ ئەرمیا وتی: خواکەی من بەڵێنی خۆی دەباتەسەر ، من پێی باوەڕدارم.

کاتێك کۆتایی نزیك بوویەوە و کاتی ئەمانی سیلسیلەی پاشایەتی ئەوان گەشت، خوا فریشتەیەکی لەروخساری مرۆڤ بۆ لای ئەرمیا نارد و فەرمووی: داوای دادپەروەری لێبکە. فریشتە هاتە لای ئەرمیا و وتی: ئەی ئەرمیا، من پیاوێك لەمنداڵەکانی ئیسرائیلم، لەتۆ لەبارەی کەس و کارم داوەریم دەوێت. من بەفەرمانی خوا ئەرکی خزمایەتی و کەس و کاری خۆم لەگەڵ ئەواندا بەهێز دەکەم و دەیپارێزم بەڵام هەرچەندە چاکە و گەورەییان لەگەڵدا دەنوێنم، لەگەڵ من دوژمنتر و خراپکارتر دەبن. ئەرمیا وتی: پەیوەندی خۆت لەگەڵ خوادا بەباشی رابگرە، ئەوەی خوا فەرموویەتی بەردەوام بێت، بەردەوام بیپارێزە. فریشتە رۆشت و دوای چەند رۆژ بەهەمان روخسار گەڕایەوە. ئەرمیا لێی پرسی: ئایا هەڵس و کەوتیان روی لەپاکی و چاکی نەکرد؟ ئایا ئەوەی دەتویست لەوانت نەبینی؟ فریشتە وتی: سوێند بەوەی تۆی بەراستی و پاکی هەڵبژارد، هیچ چاکەیەك کەهەرکەس لەگەڵ خزمان کەس و کاری خۆی دەیکات نەبووە مەگەر ئەنجامم دابێت و باشتر لەوەم کردبێت بەڵام ئەوان

بەردەوام لەسەر خراپەکاری خۆیان پێدادەگرن. ئەرمیا وتی: بگەرێرەوە لایان و زیاتر چاکەیان لەگەڵدا بکە. فریشتە هەستا و چەند رۆژێك مایەوە و لەم کاتەدا بخت النسر بەسوپایەك هاوشێوەی کولە و مێرو لەبیت المقدس دابەزی. منداڵەکانی ئیسرائیل لێیان ترسان. پاشەکەیان بەئەرمیایی وت: کوا ئەوەی خواوەند مژدەکەی پێدای؟ ئەرمیا وتی: باوەرم بەخوای خۆم هەیە.

دواتر فریشتەیەك کەخوا ئەوەی بۆ داوەری کردن بۆ لای ئەرمیا دەنارد، گەرایەوە (و ئەو لەسەر دیواری بیت المقدس دانیشتبوو). وەك جاری یەکەم قسەی خۆی کرد و لەکەس و کارەکەی و خراپەکاری ئەوان شکایەتی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تا ئەمرۆ لەسەر هەموو شتێك خۆراگریم کردووە چوونکە هۆکاری تورەبوونی خۆم بووم بەڵام کردەوەیەکی زۆر ناشیرینم لێ بینین کەبووە هۆی تووڕەیی خوای گەورە. ئەگەر ئەمرۆ هەڵس و کەوتی جارانیان بووایە، تووڕەیی من زیادی نەدەکرد بەڵام ئەمرۆ بۆ خوا تووڕەم و هاتووم لەکارەکانی ئەوان ئاگادارت بکەمەوە. سوێندت دەدەم بەو خوایەی بەراستی و پاکی تۆی نارد داوای لەناوچوونیان لەخوا بکەیت و نفرینیان بکەیت. ئەرمیا وتی: ئەی خوای ئاسمان و زەمینەکان ئەگەر ئەوان لەسەر راستی و پاکین بیانپارێزە وئەگەر هۆکاری تووڕەیی تۆن و کارێك دەکەن لای تۆ جێگی رازی بوون نییە، لەناویان بەرە. کاتێك ئەم قسە لەدەمی ئەرمیا هاتەدەر، خوا هەورەتریشقەیەکی لەئاسمانی بیت المقدسەوە نارد، شوێنی قوربانی کردن ئاگری گرت و حەوت درگا لەدرگاکانی کەوت.

کاتێك ئەرمیا ئەمەی بینی، قیژاندی و جلی دراند و خۆڵەمیشی بەسەردا کرد و وتی: ئەی پاشای ئاسمان و زەمینەکان، ئەی باشترینی باشەکان، کوا ئەو مژدەی بەمنت دابوو؟ خوا وەحی پێکرد: ئەوەی ئەوان بینیان جگە لەفەرمانی تۆ نەبوو چوونکە تۆ خۆت بەنێردراوەکەی ئێمە وت. ئەرمیا دڵنیا بوو ئەم ئەشکەنجەیە لەسەر داوای خۆی بەسەر منداڵەکانی ئیسرائیلدا باریوە و پرسیارکەر لای خواوە هاتبوو. ئەرمیا لەشار رۆشتەدەر و رۆشت و تێکەڵ بەئاژەڵە کێوی و دەشتیەکان بوو. بخت النسر و سوپاکەی هاتنە بیت المقدس. سەراسەری شامی بری و ئەوەندەی لەمنداڵەکانی ئیسرائیل کوشت کەئەوانی لەسەر زەوی پاك کردەوە و بیت المقدسی

وێران کرد و فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا خۆڵیان هێنا و پڕیان کردەوە. ئەوسا بەرەو بابل کەوتە رێ و دیلەکانی منداڵەکانی ئیسرائیلی لەگەڵ خۆی برد. فەرمانیدا هەموو پاشماوەکانی بیت المقدس کۆبکەنەوە. هەموویان کۆبوونەوە و بخت النسر لەنێوان ئەوان سەد هەزار منداڵی هەڵبژارد و ئەوانی بەسەر شا و فەرمانداکان دابەش کرد. لەناو ئەو کورانە، دانیالی پێغەمبەر و حەنانیا و عەزاریا و میشاییل دەبینران. ئەو منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ سێ دەستە دابەش کرد. یەك لەسەر سێی کوشت و یەك لەسەر سێی لەشام هێشتەوە و یەك لەسەر سێی بەدیلی گرت. خوا ژیانی درێژی بەئەرمیا بەخشی . ئەرمیا ئەو کەسەیە لەبیابانەکانی سەر زەوی و شارەکان بەردەوام دەبینرا.

بخت النسر بۆ بابل گەرایەوە. تا ئەو کاتەی خوا دەیویست لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. ئەو پاشا بوو تا خەوێکی بینی و لەناکاو شتێکی دی، هەموو شتێکی لەبیر بردەوە. دانیال و حەنانیا و عەزاریا و میشاییلی بانگ کرد و وتی: لەو خەوی بینیومە ئاگادارم چوونکە ئەگەر ئەو کارە نەکەن شانەکانتان هەڵدەکەنم. ئەوان هاتنەدەر و لەدەرگای خوا پاڕانەوە و داوایان لێکرد لەخەوەکە ئاگاداریان بکاتەوە. خوا ئەوی دەیانویست بەوانی دا و ئەوانی لەخەوەکە ئاگادار کردەوە. ئەوکات گەڕانەوە لای بخت النصر و وتیان: لەخەودا پەیکرێکت بینی. وتی: ڕاستە. وتیان: قاچ و قولاپەکانی لەگڵ بوو، ئەژنۆ و ڕانەکانی لەمس، سکی لەسیم، سینەی لەزێر و ملی لەئاسن. لەم کاتە کەتۆ لێت دەڕوانی و خۆشت دەویست خوا تاشە بەردێکی پیا کێشا و ورد هاڕی کرد و ئەمە ئەوە ئەوە بوو تۆ لە بیرت کردبوو. وتی: ڕاست دەکەن بەلاّم لێکدانەوکەی دەبێتە چی؟ وتیان: ئەوەی بەتۆیان نیشاندا پاشایەتی پاشاکان بوو کەدەستەیەکیان لەوانیتر ئەرمتر و لەپاشایەتی چاکەکارترن. یەکەم گڵێك بوو لەهەموویان ئەرمتر و سستتر. لەسەر ئەو مس بوو کە لەو باشتر و لەپێشترە. لەسەر مس، سیم بوو کە لەپێشتر و باشترە و دواتر لەسەر ئەو زێربوو کەباشتر و چاکتر لەسیمە. لەسەر ئەوان ئاسنە کەپاشایەتی تۆیە. پاشایەتی تۆ سەخت ترین و ڕێزدارترین شێوەکانی پاشایەتییە. بەلاّم ئەو تاشە بەردەی بینیت پێغەمبەرێکە خوا دەینێرێت و کارەکان دەکەوێتە دەست ئەو.

کاتێك دانیال و هاورێکانی لێکدانەوەیان بۆ خەوەکەی بخت النسر کرد، ئەوانی نزیك کردەوە و لەکارەکاندا راوێژی پێدەکردن. لەم کاتەدا هاورێکانی بخت النس (لەگەڵ هاورێکانی ئەمان لەمناڵەکانی ئیسرائیل ) رژدیان پێدەبردن و دەستیان بەدوزمانی کرد و هەندێ بابەتیان هێنایە سەرزمان کەبووە هۆی ترسی ئەو. ئەو فەرمانیدا چاڵێك هەڵبکەنن و بیانخەنە ناو چاڵەکە. لەگەڵ ئەواندا ئاژەڵی درندەی کردە خوار تا بیانخوات. دواتر هاورێکانی بخت النسر وتیان: بڕۆین بخۆین و بخۆینەوە. ئەوان رۆشتن و سەرقاڵی خواردن وخواردنەوە بوون. دواتر گەڕانەوە و ئەوانیان بینی دانیشتوون و ئاژەڵە درندەکانیان بینی دوو دەستی خۆی لەناو ئەواندا بلاّو کردۆتەوە و پەلاماری هیچ کامیانی نەداوە. لەگەڵ ئەواندا پیاوی حەوتەمیان بینی. ئەو یەکێك لەفریشتەکان بوو کەهاتەدەر و کۆڵەمستێکی لەبخت النسر دا و ئەوی سڕییەوە و لەناو ئاژەڵە وەحشییەکان کردی بەشێر، بەلاّم لەگەڵ ئەوەیشدا هەستی مرۆڤانەی مابوو. دواتر خوا روخساری بۆ روخساری مرۆڤ و پاشایەتییەکەی بۆ گەڕاندەوە. کاتێك پاشایەتی بۆ گەرایەوە، دانیال و هاورێکانی بوونە بەرێزترین کەسەکەکان لای ئەو. پارسییەکان گەڕانەوە و لە دانیال و هاورێکانی لای بخت النصسر دووزمانی و ئاژاوەگێریان کرد و وتیان: کاتێك دانیال شەراب دەخوات لەتاو میز کردن ناتوانێت خۆی رابگرێت و ئەمە کارە لای ئەوان شەرم بوو. بخت النسر خواردنی بۆ دروست کردن و دانیالی بۆ لای خۆی بانگ کرد و بەدەرگاوانی وت: یەکەم کەس بۆ میز کردن دێتەدەر بیکوژە و ئەگەر وتی من بخت النسرم، بڵێ درۆ دەکەیت چوونکە بخت النسر منی بەکوشتنی تۆ فەرمانداوە.

لەم کاتەدا خوا میز کردنی لەسەر دانیال هەڵگرت و یەکەم کەس لەناو ئەم تاقمە هاتەدەر، بخت النسر بوو کە نیشانی دەدا من پاشام و ئەمە لەکاتی شەودا بوو. کاتێك دەرگاوان ئەوی بینی، هێرشی کردە سەر تا بیکوژێت. پێی وت: من بخت النسرم، دەرگاوان وتی: درۆ دەکەیت چوونکە بخت النسر فەرمانی پێدام تۆ بکوژم. دەرگاوان کوشتی.

لەبارەی هۆکاری کوژرانی داستانی تریش وتراوە بەمشێوە: خواوەند مێشێکی بۆ نارد

ورۆشتە ناو لوتی. ئەوەندە رۆشتە سەر تا گەشتە سەری. ناسودەیی و نارامی نەبوو مەگەر ئەوی لەسەریان بدایە (یا خۆی سەری بە دار و دیواردا دەکێشا) کاتێك سەردەمی مەرگی هات، بەکەسەکانی وت: سەرم بقڵشن و ببین چییە منی بێزار کردووە. کاتێك مرد وسەریان قڵشت، مێشەکەیان لەناو مێشکیدا بینی، تا خوا بەهێزی خۆی بەبەندەکانی نیشان بدات و سستی و ناتەوانی بخت النسر ناشکرا بکات لەبەر ئەوەی کاتێك یاخیگەری کردە پیشە، خوا بەناتەوانترین نافرێنراوەکانی خۆی ئەوی لەناو برد، لەپێش و بەرزتر و پاکە خوایەك فەرمانی هەموو شتێك بەدەست ئەوە، هەرچی بیەوێت دەیکات و هەرچی بیەوێت دەیدات.

دانیال لەسەرزەمینی بابلدا مایەوە و دواتر رۆشتە شووش کەیەکێکە لەشارەکانی خوزستان. لەوێ مرد و بەخاك سپێردرا.

کاتێك خوای گەورە ویستی منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ بیت المقدس بگەڕێنێتەوە، بخت النسر مردبوو چوونکە ئەو دوای وێران کردنی بینت المقدس بەوتەی هەندێ لەزاناکان چل ساڵ مایەوە و دوای ئەو یەکێك لەکورەکانی بەناوی ئوالمردج یا (والمردج) پاشایەتی گرتەدەست و بیست و سێ ساڵ لەو سەرزەمینە پاشایەتی کرد ومرد و دوای خۆی کورەکەی بەناوی بلتاسر یەك ساڵ پاشایەتی کرد. کاتێك ئەو لەسەر تەخت دانیشت، بارودۆخ ئاڵۆز و پاشای ئێران ئەوی لابرد. لەبارەی ئەو وەك ئاماژەمان پێدا بۆچوونەکان جیاوازە. دوای ئەو داریوشی بەسەر بابل و شام کردە فەرمانرەوا کە سێ ساڵ مایەوە. داوتر ئەوی لابرد و لەجیاتی ئەو ئەخشویرشی دانا کە سیانزە ساڵ مایەوە و دوای ئەوە کوڕەکەی کیرش علمی (کوڕشی گەورە) لەسیانزە ساڵی بوو بەپاشا. ئەو تەورات فێرببوو و باوەڕی بەئایینی یەهودی هێنابوو. ئەو لەدانیال و هاورێکانی وەك حەنانیا و عەزاریا و کەسانیتر زانیاری زۆری وەرگرت. ئەوان داوایان لەکوڕشی گەورە کرد فەرمان بەجولەکەکان بدات بۆ بیت المقدس بگەرێنەوە. ئەو وتی: ئەگەر لەئێوە هەزار پێغەمبەر بەجێدەمان، دەستبەرداری ئێوە نەدەبووم. ئەو دانیالی بۆ پێگەی داوەری کردن بەرز کردەوە و هەموو کارەکانی خۆی بەو سپارد و فەرمانی پێدا ئەوەی بخت النسر لەمنداڵەکانی ئیسرائیلی بەتاڵان بردووە، لەناو ئەواندا دابەشی بکات. هەروەها فەرمانی پێدا بیت المقدس ئاوەدان بکاتەوە. ئەم

شارە لەرۆژگاری ئەو ئاوەدان بوویەوە و منالّەکانی ئیسرائیل گەڕانەوە.
ئەم ماوە لەفەرمانڕەوایی ئەم پاشایانە، لەوێرانی بیت المقدسەوە مێژوەکەی دەنوسرێتەوە کە لەسەر دەستی بخت النسر ئەنجامدرا. رۆژگاری پاشایەتی کورش بیست و دوساڵ بوو.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی فەرمانی گەڕانەوەی منالّەکانی ئیسرائیل بۆ شام دا، بشتاسب کوڕی لهراسب بوو. هەواڵی وێرانی شامیان پێدا و پێیان وتبوو: کەس لەمنالّەکانی ئیسرائیل لەوێ نەماوەتەوە. ئەو لەسەرزەمینی بابل جاریدا: هەرکەس لەمنالّەکانی ئیسرائیل دەیەوێت بۆ شام بگەڕێتەوە، دەبێت بگەڕێتەوە. پیاوێکی لەبنەماڵەی داوود کردە پاشای ئەوان و فەرمانی پێدا سەرلەنوێ بیت المقدس ئاوەدان بکاتەوە. منالّەکانی ئیسرائیل گەڕانەوە و ئەو شارەیان دروست کردەوە.

ئەرمیا کوڕی خلقیا (حزقیا) لەتیرەی هارون کوڕی عیمران بوو. کاتێك بخت النسر هێرشی کردە سەر شام و بیت المقدسی وێران کرد و منالّەکانی ئیسرائیل کوشت وبەدیلی گرتن، لەشارەکان خۆی دوور خستەوە و تێکەڵ بەئاژەڵە کێوی و دەشتیەکان بوو. کاتێك بخت النسر بۆ بابل گەرایەوە، ئەرمیا سوار لەسەر کەرێك بەگوشراوی ترێ و سەوەتەیەك هەنجیر گەشت و بیت المقدسی بەوێرانی بینی و وتی: کەی خوا ئەمانە دوای مردن زیندوو دەکاتەوە. خوا ئەوی بۆ سەد ساڵ مراند (بقرە/٢/٢٥٩). دواتر کەرەکەی ئەوی مراند و چاوەکانی لەوان دوور خستەوە و کاتێك بیت المقدس ئاوەدان بوویەوە، خوا ئەرمیایی زیندوو کرد.ەوە. سەرەتا ژیانی بۆچاوی گەڕاندەوە و دواتر جەستەی زیندوو کردەوە و ئەو دەیروانی. پێی وترا: چەندە خەوتبوویت؟ وتی: رۆژێك یا بەشێك لەرۆژ. پێی وترا: سەد ساڵ خەوتبوویت. ئێستا لەخواردن و خواردنەوەی خۆت بروانە کەهیچیان بەسەر نەهاتووە – ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا نەهاتوە. و لە کەرەکەت بروانە(بقرە/٢/٢٥٩). سەیری کەرەکەی خۆی کرد کەبەشەکانی یەك یەك پەیوەستی یەکتر دەبوونەوە و دواتر بەگۆشت داپۆشران و دواتر خوا فەرمانی زیندوو بوونەوەی پێدا و لەشوێنەکەی هەستا و سەیری شاری

کرد کەناوەدان دەکرێتەوە و منداڵەکانی ئیسرائیل تیایدا زۆربوونەتەوە و لەشارەکانەوە روی تێدەکەن.
ئەو وێرانی و کوژرانی و دیل کرانی خەڵکەکەی لەبیر بوو. کاتێك بەئاوەدانی بینی، وتی: ئێستا زانیم خوا بۆ هەر کارێك بەتوانایە (بقرە/٢/٢٥٩).

دەستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی خوا بۆ سەد ساڵ مراندی و دواتر زیندووی کردەوە، عوزەیر بوو. کاتێك زیندوو بوویەوە، ویستی بڕواتە ماڵەکەی خۆی لەبیت المقدس و لەوێ پیرێژنێکی کوێری بینی کەپێشتر کەنیزی بوو و ئێستا تەمەنی سەد و بیست ساڵ بوو. لێی پرسی: ئایا ئێرە ماڵی عوزەیرە؟ پیرێژن گریا و وتی: بەڵێ، دەبینم جگە لەتۆ کەس عوزەیر بیر ناهێنێتەوە. وتی: من عوزەیرم. پیرێژن وتی: عوزەیر داوای هەرچی لەخوا بکردایە پێی دەدا. داوا لەخوا بکە من باش بکاتەوە. ئەو داوای لەخوا کرد و پاڕایەوە، سۆمای چاو بۆ پیرێژنەکە گەرایەوە و هەستا و بەرێگادا رۆشت و کاتێك ئەوی بینی، ناسییەوە. لەم کاتەدا عوزەیر کوڕێکی بوو سەد و سیانزە ساڵ و منداڵەکانی کە گەورە ببوون. کەنیزەکە رۆشت و هەمووانی ئاگادار کردەوە. ئەوان هاتن و کاتێك بینیان، کوڕەکەی ئەوی لەروی نیشانەیەك(خاڵێك) کە لەپشتیدا بوو، ناسییەوە.

دەستەیەك دەڵێن: عوزەیر لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل لەعێراق بوو و دواتر هاتە بیت المقدس و تەوراتی بۆ منداڵەکانی ئیسرائیل تازە کردەوە چوونکە کاتێك ئەوان بۆ بیت المقدس گەڕانەوە، تەوراتیان پێنەبوو لەبەر ئەوەی لێیان سەندبوون و لەگەڵ شتەکانیتر سوتاندبوویان و لەناویان بردبوو. عوزەیر لەگەڵ دیلەکاندا گیرابوو. کاتێك گەرایەوە بۆ بیت المقدس، شەو و رۆژ دەگریا و خۆی لەخەڵك بەدوور دەگرت. لەو کاتەی لەم حاڵەدا بوو و خەمبار دەگریا، پیاوێك هاتە لای ( و ئەو دانیشتبوو) و وتی: ئەی عوزەیر بۆ دەگریت؟ وتی: لەبەر ئەوەی نوسراوی خوا لەناو ئێمەدا بوو و ئێستا لەناوچووە. وتی: ئایا دەتەوێت خوا بۆ ئێوەی بگەرێنێتەوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: بگەرێرەوە و رۆژو بگرە و خۆت پاك و خاوێن بکە و ژوانی ئێمە بەیانی ئێرە بێت کەلێرەدا یەکتر دەبینین. عوزەیر ئەم کارەی کرد و هاتە ئەوێ و چاوەروانی هاتنی

ئەوی دەکرد. ئەو پیاوە دەفرێك ناوی هێنا (ئەو فریشتەیەك بوو خوا لەروخساری مرۆڤدا ناردبووی) لەو ئاوەی دەرخوارد دا و لەناکاو تەورات لەدڵیدا نەخشی بەست. ئەو گەڕایەوە بۆ لای منداڵەکانی ئیسرائیل و تەوراتی بەوان سپارد و ئەوان بەهەموو حەلاڵ و حەرام و سنورەکانی، ناسیانەوە و زۆریان خۆشدەوێست بەشێوەیەك کەسیان پێشتر ئەوەندە خۆش نەویستبوو. کارەکانی ئەوانی ڕێکخست و لەناو ئەواندا مایەوە تا خوا گیانی گرت و بردییەوە بۆ لای خۆی. دووبارە لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل کاری ناشیرین و قێزەون دەرکەوتەوە کەدەستەیەك لەوان وتیان: عوزەیر کوری خوایە. منداڵەکانی ئیسرائیل لەبیت المقدس بوون و لەشوێنەکانیتر دەهاتنە ئەوێ و ژمارەیان زیادی کرد تا رۆمیەکان هاتن و لەسەردەمی (پاشاکانی تیرەکان) بەسەریاندا زاڵ بوون و دوای ئەوە چیتر لەدەوری یەك کۆنەبوونەوە.

زاناکان لەبارەی داستانی بخت النسر و ئاوەدان کردنەوەی بیت المقدس جیاوازی قووڵیان هەیە کە ئێمە بۆ ڕێز گرتن لەکەمبێژی، زۆریمان پشت گوێ خست.

## داستانی شەر کردنی بخت النصر لەگەڵ عەرەب

دەڵێن: خوا بەبەرخیا کوڕی حنیا (ئەحنیا)وەحی کرد و پێی فەرموو بەبخت النصر بڵێت بۆ ناسپاسی کردنی عەرەبەکان هێرشیان بکاتە سەر و شەرکەرەکانیان بکوژێت و ژن و منداڵەکانیان بەدیلی بگرێت و سامانەکانیان بەفیرۆ بدات. بەرخیا پەیامەکەی خوای گەیاند. بخت النصر لەعەرەبە بازرگانەکان لەولاتەکەی خۆی دەستی پێکرد و ئەوانی گرت. لەنەجەف بێستانێکی بۆ دروست کردن و ئەوانی تیا زیندانی کرد و پاسەوانی بۆ دانان. ئەم هەواڵە لەناو عەرەبەکان بلاو بوویەوە و دەستەیەکیان بۆ خۆپاراستن هاتنە لای بخت النسر و داوای ئەمانیان کرد. لێیان خۆشبوو و ئەوانی لەسواد جێگە کردەوە. ئەوان شاری ئەنباریان دورست کرد و بخت النسر خەڵکی حیرەی رزگار کرد و ئەوان لەسەراسەری ژیانی ئەو لەوێ نیشتەجێ بوون.

کاتێك مرد پەیوەستی دانیشتوانی ئەنبار بوون و ئەمە یەکەم مانەوەی عەرەبەکان لەسودا و ئەنبار و حیرە بوو. لەوە بەدوا عەرەبەکان بەرەو نجد و حیجاز بەرێکەوتن و خوا وەحی بەبەرخیا و ئەرمیا کرد و فەرمانی بەوان دا برۆنە لای مەعد کوڕی عەدنان و بیگرن و بیهێنن بۆ حەران. خوا ئەم دووانەی ئاگادار کردەوە کەمحمد دوایین پێغەمبەر(د.خ) لە نەژادی ئەو دەبێت. ئەم دووانە بەرێکەوتن تا و پێش بخت النسر گەشتنە مەعد و هەمان کات ئەویان بۆ حەران هێنا. ئەو لەمکاتەدا دوانزە ساڵی بوو. لەملا بخت النسر بەرێکەوت و چاوی بەعەرەبەکان کەوت و دەستی بەشەڕ کردن کرد و تێکیشکاندن و زۆری کوشت و رەوانەی حیجاز بوو. عەدنان عەرەبەکانی کۆکردەوە و لە(زاتی عیرەق) شەڕی لەگەڵ بخت النسردا کرد. شەڕێکی قورس رویدا و عەدنان تێکشکا و بخت النسر تا قەلاَکانی ئەوێ شوێنی کەوت. عەرەبەکان دەوری عەدنانیان گرت و هەرکام لە دوو لاوە بۆ خۆی و کەسەکانی خەندەکی دروست کرد. بخت النصر سەنگەری دروست کرد. یەکەم کەس بوو سەنگەری دروست کرد. شمشێرەکانی ئەوانیان گرت و ئەوان هاواری داخ وپەشیمان بوونەوەیان بەرز بوویەوە و عەدنان دەستی لە بخت النسر هەڵگرت و بخت النسر دەستی لەعەدنان. دوو دەستەکە لەیەك جیابوونەوە. کاتێك بخت النسر رۆشت، مەعد کوڕی عەدنان لەگەڵ پێغەمبەرەکان هاتەدەر و رۆشت تا گەشتە مەککە و سەرلەنوێ دروستی کردەوە و

ناڵاکانی بەرز کردەوە و حەجی کرد و پێغەمبەرەکان لەگەڵیدا حەجیان کرد. مەعد هاتە دەر و رۆشت تاگەشت ئیسوت (ئیشوب،ریسوب) و لەپاشماوەکانی بنەماڵەی حرس کوڕی مفاز جەرعەمی پرسی. پێیان وت: جەوشەم کوڕی جەلهەمە ماوەتەوە. مەعد کچەکەی ئەوی کردە هاوسەری خۆی و ئەو ژنە نزار کوڕی مەعدی بۆ هێنایە دنیا.

## داستانی بشتاسب و روداوەکانی رۆژگاری پاشایەتی ئەو وکوژرانی باوکی لهراسب

کاتێك بشتاسب کوڕی لهراسب لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، بە بەهێزی پاراستی و ئایینەکانی سەرلەنوێ زیندوو کردەوە و لەفارس بناغەی شاری (فسا)ی دارشت و حەوت کەس لەگەورە پیاوانی ولاتەکەی یەکیەك لەپێگە شایانەکانی ئەوێ دانا و بەهەرکام ولاتێك بەئەندازەی پێگەکەی بەخشی. دواتر ئەو نامەبەر وپەیامی ڕەوانەی دەرباری شای تورکەکان کرد کەناوی خزراسف بوو براکەی ئەفراسیاب. ئەو سەرەتا ویستی ئاشتیان لەگەڵ بکات و ئاشتی بشتاسب لەسەر ئەمە ئارامی گرت کەبشتاسب لەدەرباری خزراسف ئەسبێکی ئامادەی غاردان و سوارکارێکی شارەزای هەبێت تا لەهەر کاتێکدا هەواڵەکان بەو بگەیەنێت. ئەم شێوەیەك بوو لەدەرباری پاشاکان ڕێزی لێدەگیرا و دەپارێزرا و پاشا کەم دەسەلاتەکان ئەو مافەیان پێدەدان. کاتێك زەردەشت هاتە لای بشتاسب و – بەو شێوەی ئاماژەمان پێدا—کردیە شوێنکەوتوی خۆی، داوای لێکرد پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکەکان بشکێنێت. زەردەشت پێی وت: من بۆ تۆ ئەستێرەیەك ئەندازە دەگرم و کاتێك نیشان دەدەم تا برۆیتە شەڕ و سەرکەوتن بەدەست بێنیت. ئەمە یەکەمجار بوو بۆ پاشاکان کاتی دەسپێکردنی کارەکانیان بەروانین لەئەستێرەکان دەستنیشان دەکرد. زەردەشت ئەستێرەناسێکی ئاگا و زانا بوو. بشتاسب فەرمانی پێدا ئەم کارە بکات. کەسێکی بۆ دەرباری پاشای تورکان نارد تا ئەو ئەسب و سوارکارە بگەرێنێتەوە. پاشای تورك تورە و پەیك وپەیامی نارد وئاگاداری کردەوە و بۆ ئەو کارە سەرکۆنەی کرد و فەرمانیدا زەردەشت بۆ دەرباری ئەو بنێرێت و ئەگەر نەینێرێت خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکات و خۆی و بنەماڵەکەی کوشتار دەکات.

بشتاسب نامەیەکی توندی بۆنارد و ئەوی لەشەر ئاگادار کردەوە. هەرکام سوپای خۆی ڕەوانە کرد و لەنێوانیان شەڕێکی قورس رویدا و تورکەکان شکان و بەسەختی کوشتار

کران و هەلآتن. بشتاسب گەرایەوە بەلخ و زەردەشت لای ئێرانییەکان پێگەی بەرزتربوویەوە چوونکە ئەم سەرکەوتنە بەفەرمودەی ئەو بەدەست هاتبوو.
ئەوەی زیاتر لەهەمووان لەم شەڕە پلەو پایەی بەرز بوویەوە، ئیسفەندیار کوڕی بشتاسب بوو. کاتێك شەڕ کۆتایی هات، خەڵکان لەنێوان ئیسفەندیار و بشتاسب دووزمانیان کرد و وتیان: ئەو پاشایەتی بۆ خۆی دەوێت. پاشا بەردەوام ئەوی بۆ شەر دەنارد دواتر گرتی و بەندی کرد و ناردییە زیندان.

دواتر بشتاسب بۆ شەڕ روی کردە کرمان و سیستان و رۆشتە کێوێك کەپێیان دەوت **طمبدر** (**طمیدر**) و دەستی بەخۆپارێزی وپەرەستنی خوا کرد. ئەو باوکی خۆی لهراسب کە لەم کاتەدا پیر وپەککەوتە بوو. لەبەلخ وەك جێگری خۆی ناساند و ژن و منالّ و سامانەکانی خۆی لەوێ دانا. هەواڵەکان بەپاشای تورکەکان خزراسف گەشت و کاتێك ئەو راستی هەواڵەکانی زانی، لەشکرەکەی خۆی کۆکردەوە وبەرەو بەلخ بەرێکەوت و دەرفەتی نەبوونی بشتاسبی بەهەلّ زانی. کاتێك گەشتە بەلخ، ئەو شارەی گرت ولهراسب و دوو کوڕەکەی بشتاسب و هیربدانی کوشت و ئاتەشکەدەکانی وێران کرد و زۆر لەنێرانییەکانی بەدیلی گرت و بۆ ولآتەکەی خۆی ڕەوانەی کردن. تورکان زۆریان کوشت و زۆریان بەدیلی گرت و وێرانی زۆریان لەدوای خۆیان بەجێهێشت. خزراسف دوو کچی بشتاسبی بەدیلی گرت کەیەك لەوان خەمانا بوو. ئەو گەورەترین ئالآی ئێرانی یانی ئالآی کاویانی هەلگرت و شوێن بشتاسب کەوت. بشتاسب رایکرد و لەو کوێستانەکان لەفارسی خۆی حەشاردا. ئەو لەم پێشهاتە سەری لێشێوابوو.
کاتێك رۆژگاری دژوار بوو، زانای ئێرانی جاماسبی ناردە لای کورەکەی ئیسفەندیار و داوای لێبووردنی لێکرد و بەلێنی پاشایەتی دوای خۆی پێدا. کاتێك ئیسفەندیار هەواڵەکەی پێگەشت، زەوی ماچ کرد وهات و سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و شەوی بەسامانداننی سوپا بەسەر برد و بەیانی بۆ شەری تورکەکان بەرێکەوت. دوو سوپا ریزیان بەست و شەڕێکی قورس رویدا و ئاگری شەڕ بلێسەی سەند. ئیسفەندیار لەلایەك هێرشی کردە سەر لەشکری تورك و کەلێنی تیا دروست کرد و بەتەواوی

لاوازی کردن. لەناو تورکەکاندا بلاو بوویەوە ئەمجارە ئیسفەندیار بۆ شەڕ هاتووە. ئەوان رایانکرد و ئاوڕیان نەدایەوە وئیسفەندیار گەڕایەوە و ئالآی کاویانی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

کاتێك ئیسفەندیار هاتە لای باوکی، مژدەی پێدا و ئەوی بۆ بەدواداچوونی تورکەکان فەرماندا و فەرمانی پێدا پاشای تورکەکان و هەموو کەس و کاری بکوژێت وهەرچەندە دەتوانێت زیاتر لەتورکەکان کوشتار بکات و ئەو دیل و تالآنییانەی لەولآتەکەی برابوو ، بگەڕێنێتەوە. ئیسفەندیار بەرێکەوت و رۆشتە ناو قولآی ولآتی تورکەکان.و زۆری کوشت و زۆری بەدیلی گرت و وێرانی زۆری نایەوە و گەشت بەردەم تەختەکەی ئەوان و پاشا و برا و پیاوە شەڕکەرەکانی کوشتار کرد و ژنەکانی ئەسیر و دوو خوشکەکەی خۆی رزگار کرد. ئەو سەراسەری ئەو سەرزەمینە گەڕا و گەشتە کۆتایی سنوری تورکەکان و دەستی بەسەر تیبتدا گرت. بەشە جۆراوجۆرەکانی بەخشی بە گەورە و گەورەکانی تورکەکان و ئەمە دوای ئەوە بوو کەئەمانی پێدان. هەروەها باجی خستە سەر تورکەکان تا بۆ دەرباری پاشا بشتاسبی بنێرن.

لەمکاتەدا باوك رژدی بەکور برد چوونکە ئەو لەداگیرکاری و سەرکوت کردنی تورکەکان نازایەتی لەخۆی نیشاندابوو. ئەم رِقەی لەدڵی خۆیدا شاردەوە و فەرمانی بەکورەکەی دا سوپا ئامادە بکات و بۆ شەڕی پاڵەوانی جیهان رۆستەمی دەستان لەسیستان بڕوات. پێی وت: ئەم پاڵەوانە لەناو قولآیی ولآتەکەی ئێمەدایە و فەرمان لەئێمە نابات چوونکە کەیکاوس ئەوی ئازاد کردووە و سیستانی پێبەخشیوە. ئەم بابەتەمان لەداستانی پاشایەتی کەیکاووس ئاماژە پێدا. بشتاسب لەدڵدا چاوەڕوان بوو رۆستەم ئەم بکوژێت یا ئەم رۆستەم. ئەو رۆستەمیشی بە دوژمن دەزانی،، ئیسفەندیار سوپای ئامادە کرد و رەوانەی شەڕی رۆستەم بوو تا سیستانی لێ وەربگرێت. رۆستەم روبەروی بوویەوە و شەڕی لەگەڵدا کرد وئەوی کوشت. لەمکاتەدا بشتاسب مرد و رۆژگاری پاشایەتی ئەو ١١٢ ساڵ یا ١١٥ ساڵ یا ١٥٠ ساڵ بوو.

دەستەیەك دەڵێن: پیاوێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل هاتە لای کەگومانی دەکرد

پێغەمبەرە و بۆ ئەو نێردراوە. ئەو لەبەلخ چاوی پێیکەوت. ئیسرائیلی بەعیبری قسەی دەکردو زەردەشت پێغەمبەری ئێرانی قسەکانی ئەوی وەردەگێرایەوە و جاماسب زانای ئێرانیش ئامادە بوو و قسەی ئیسرائیلی ئەویش وەریدەگێرایەوە. بشتاسب و باوباپیران و ئێرانییەکان، پێش هاتنی زەردەشت لەسەر ئایینی سائبی بوون و دوای هاتنی ئەو بوونە خواپەرەست.

## هەواڵی کاری پاشاکانی یەمەن لە ڕۆژگاری کەیکاووس تا سەردەمی بەهەمەن کوڕی ئیسفەندیار

لەرابردوودا ئاماژەمان بەوەدا دەستەیەك گومان دەکەن کەیکاووس هاوڕۆژگاری سلێمان کوڕی داوود بووە. ئێمە پاشاکانی هاوڕۆژگاری سلێمان مان باس کرد و داستانی بلقیس کچی ئیلشەرحمان ئاماژە پێدا. دوای بلقیس پاشایەتی بەیاسر کوڕی عەمرۆ کوڕی یەعفەر گەشت کەپێیان دەوت (انعم تلانعامە). خەڵکی یەمەن دەڵێن: ئەو بۆ شەڕ بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆشت تاگەشت شوێنێك بەناوی وادی الرمل( زیخەلآن). پێش ئەو کەس نەگەشتبووە ئەوێ. کاتێك گەشت، ڕێگەی بەرەو پێش چوونی بەداخراو بینی چوونکە بەرد وزیخ زیاتر لەچاوەڕوانییەکانی ئەو بوو. لەو کاتەی لەوێ بوو، زیخ ئەما فەرمانی بەپیاوێك بەناوی عەمرۆدا پێشڕەوی بکات. ئەوان ڕۆشتنە پێش و نەگەڕانەوە. کاتێك ئەمەی بینی، فەرمانیدا و بتێکی مسینیان دروست کرد و لەوێ داینیشاند. بت دروست کرا و لەسەر تاشەبەردێك لای دۆڵەکە دانرا. بەخەتی مەسنەد لەسەریان نوسی: ئەم بتە هی یاسری ئەنعەمی حێمیریە. لێرەوە ڕێگا بۆ هیچ شوێنێك نییە. کەس ڕەنجی ئەم کارە نەخاتەسەر شانی خۆی چوونکە بەهیچ کوێ ناگات.

دەستەیەکیتر دەڵێن: لەو سەری زیخەلآنەکە خەڵکانێك لەنەتەوەی موسا دەژین وئەوان ئەو کەسانەن خوا لەم ئایەدا ئاماژەی پێداوە: لەنەتەوەی موسا خەڵکانێك هەن لەراستی ودروستی ڕێگا دەکۆڵنەوە و پیایدا دەڕۆن(اعراف/٧/١٥٩).

دوای ئەو تەبع گەشتە پاشایەتی و ئەو تبان و ئەو ئەسعەد و ئەو باوکی کرب کوڕی ملکیکرب تەبع کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی تەبع و ئەو زوالازعار کوڕی ئەبرەهە تەبع زوالمنار کوڕی رایش کوڕی قەیس کوڕی سەیفی کوڕی سەبا بوو و پێیان دەوت زاید. ئەم تەبعە هاوڕۆژگاری بشتاسب و ئەردەشیری بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار کوڕی بشتاسب بوو. ئەو لە ماڵ هاتەدەر و ڕوی کردە یەمەن و ئەو ڕێگای گرتەبەر کەرایش پێشتر پیایدا ڕۆشتبوو. ڕۆشت تا گەشتە دوو کێوی تەی. دواتر ویستی بڕواتە ئەنبار.

کاتێك گەشتە شوێنی حیرە، حەیران بوو. شەو داهات، لەوێ مایەوە و لەبەر ئەمە بەو شوێنەیان وت حیرە. لەوێ خەڵکانێك لە ئەزد، لەخم، جوزام، عاملە و قوزاعەی بەجێهێشت کەماڵیان دروست کرد ولەوێ مانەوە.

دواتر خەڵکانێکیتر لەتەی، کەلب، سکون، بلحرس کوڕی کەعب وئەیاد پەیوەستیان بوون. ئەوسا روی کردە موسڵ و رۆشتە ئازەربایەجان و روبەروی تورکەکان بوویەوە و ئەوانی تێکشکاند و پیاوە شەڕکەرەکانی کوشت و ژن و منداڵەکانی بەدیلی گرت و گەرایەوە بۆ یەمەن و لێرەوە پاشاکان ترسی ئەویان کەوتە دڵەوە و دیاریان بۆنارد. دیاری پاشاکانی هیندیان بۆهێنا کە لەناویاندا پێشکەشی فراوان وەك هەوریشم و عوود و تازە دروست کراوەکانی هیند دەبینرا. هاوشێوەی ئەو دیارییانەی نەبینیبوو و لەبەر ئەمە بەنێردراوی وت: هەمووی ئەمانە بەرهەمی وڵاتەکەی خۆتانە؟ وتی: زیاترەکەی لەچینەوەیە. ئەو وسفی چینی بۆکرد. سوێندی خوارد بێگومان هێرشی دەکاتەسەر. ئەو سوار لەسەر کەر بەرێکەوت تا گەشتە خەڵکانێکی ئەزان کەهەموویان کڵاوی رەشی درێژیان لەسەردابوو. ئەو پیاوێك لەهاوەڵەکانی خۆی بەناوی سابت بۆ چین نارد. سابت تێکشکا. تەبع بەرێکەوت و رۆشتە ناو قوڵایی چین و پیاوە شەڕکەرەکانی کوشت و هەرچی دەسکەوت تاڵانی کرد. رۆشتن و مانەوە و گەڕانەوەی ئەو حەوت ساڵی خایاند.

ئەو لەتیبت دوانزە هەزار سواری کەری بەجێهێشت و ئەمانە هەر ئەو خەڵکەی تیبتن و گومان دەکەن عەرەبن. رەنگیان رەنگی عەرەب و عادەت و هەڵس و کەوتیشیان.

بەمشێوە داستانەکەیان گێراوەتەوە: زۆربەی مێژوو نوسەکان لەگەڵیدا بەلارێدا رۆشتوون و هەرکام قسەیەکی ناڕەوای لەگەڵ ئەویتردا وتووە. دەستەیەك ئەوانەی کەسانیتر لەسەرەتادا باسیان کردووە پشت گوێیان خستووە کەسوودی لێبەدەست نایەت و ئێمە ئەوەی دەستمان دەکەوێت بەگێڕانەوەی کورت و چڕ دەیگێڕینەوە.

## سەربووردەی ئەردەشیری بەهەمەن و کچەکەی خەمانا

دوای بشتاسب کوردەکەی ئەردەشیری بەهەمەن کوڕی ئیسفەندیار لەسەر تەخت دانیشت. لەشەڕەکانی خۆی پیاوێکی کامەران بوو و دوای باوکی فەرمانڕەوایەتی کرد.
دەڵێن: لەسواد شارێکی دروست کرد و ناوی نا ئەیاوانی ئەردەشیر کە هەمان دێهاتی ناوداری هومەینیا (بەهمەن شا)یە کە لە زابی سەرووە.
ئەو لەشارستانی فەراغ دیجە شاری ئوبلەی دروست کرد و دواتر رۆشتە سیستان بۆ سەندنەوەی تۆڵەی باوکی و رۆستەم و کوڕەکەی فەرامەرزی کوشت.
بەهمەن باوکی دارای گەورە و باوکی ساسانە کەباوکی پاشا ناودارەکانی ئێران- ئەردەشیر کوڕی بابەك و منداڵەکانی -ئەوە. دایکی دارا خەمانا کچی بەهمەنە کەخوشك و دایکی ئەوە.

بەهمەن بەیەك هەزار هەزار (یەك ملیۆن)پیاوی شەڕکەر رەوانەی شەڕی ناوخۆیی (رۆمی رۆژهەڵات) بوو. پاشاکانی جیهان باجیان بۆ دەنارد و دیارترین و وشیارترین پاشای ئێران بوو.
دایکی بەهمەن لەنەژادی بنیامین کوڕی یەعقوبە و دایکی کوڕەکەی ساسان لەنەژادی سلێمان کوڕی داوود. زەمانی پاشایەتی ئەو سەد و بیست ساڵ یا سەد و هەشتا ساڵ درێژەی کێشا. پیاوێکی نەرم و نیان و پەسەندی ئێرانییەکان بوو. لەسەرەتای نامەکانی خۆی بەم شێوەی دەنوسی:( لەبەندەیەك کەخوا دەپەرستێت و ریشتەی کارەکانی ئێوەی لەدەستدایە).
دوای ئەو کچەکەی خەمانا بەپاشایەتی گەشت و خەڵك بۆ رێزگرتن لەباوك و بەرز نرخاندنی یادی فرەزانی ئەو، ئەویان هێنایە سەرتەخت. ئەو ناوی خۆی نا شەهرزاد. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوە بوو بەپاشا چوونکە کاتێك بەدارای گەورە لەبەهمەن سکپڕبوو، داوای لەمێردەکەی کرد بۆ رێزگرتن لەو کورەی لەسکیدایە، تاجەکە بخاتەسەر سکی ئەو و پاشایەتی تایبەت بەو بکات. بەهمەن ئەم کارەی کرد و

لەکاتێك ئەو لەسکی دایکدابوو، تاجی خستەسەر سکی شەهەرزادی دایك.

ساسان کوڕی بەهمەن پیاوێك بوو هەڵس وکەوت و کردەوەی شایانەی لەخۆی نیشان دەدا بەلاّم بۆ پاشایەتی شیاو نەبوو. کاتێك کاری باوکی بینی، بەرەو ئیستەخر بەڕێکەوت و پارسایی کردە پیشە و رۆشتە سەر بەرزایی کوێستانەکان ڕانەمەڕێکی دەلەوەراند کەزۆرینەی خەڵك ئەم کارەی ئەویان پەسەند نەدەکرد.
بەهمەن لەکاتێکدا مرد کەدارا لەسکی دایکی دابوو. لەبەر ئەمە خەڵك وەك پاشا هەڵیانبژارد. ئەم ژنە دوای چەند مانگ لەپاشایەتی خۆی دارای هێنایە دنیا بەلاّم پێی خۆش نەبوو ئاشکرای بکات. لەبەر ئەمە ئەوی خستە ناو تابوتێك و زێر و گەوهەری کردە ناو تابووتەکە و لەشوێنێکی شاری ئیستەخر کردییە ناو روباری (کۆر). دەستەیەك دەڵێن: خستییە روباری بەلخەوە. تابووت دەست ئاشەوانێك لەخەڵکی بەلخ کەوت کە بەبینینی زێر و گەوهەرەکەی شادمان بوو. ژنەکەی سەرپەرەستی منالّەکەی گرتە ئەستۆ و بەخێوی کرد. کاتێك منالّەکە گەشەی کرد، نهێنییەکەی ئاشکرابوو و خەمان بێزار بوو لەوەی خراپەی لەگەڵدا کردووە (و ئەو کوری بەهمەنە). کاتێك گەورە بوو، ئەویان تاقی کردەوە، لەرازاوەیی لەرێگا رۆشتن و هەڵس و کەوتی هاوشێوەی شازادەکان باشترین بوو. دایکی تاج و تەختی پێسپارد.
شەهرزاد بەرەو فارس بەرێکەوت و بناغەی شاری ئیستەخەری دارشت و دروستی کرد. ئەو لەشەردا کامەران و بەختەوەر بوو و چەند جارێك لەگەڵ رۆمەکان شەڕی کرد. بەلاّی دوژمنانیان لەولاّت دوور خستەوە و باجی لەسەر خەڵك سوك کرد و رۆژگاری پاشایەتی ئەو لەسی سالّدا کۆتایی پێهات.
دەستەیەك دەڵێن: ـخەمانا خۆی دارای پەروەردە کرد تا گەورە بوو و ئەوسا تاج و تەختی پێسپارد و خۆی لەسەر کار لابرد. دارا بوێرانە و وشیارانە پاشایەتی کرد.

ئێستا دەگەرێنەوە بۆ داستانی منالّەکانی ئیسرائیل و مێژووی رۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەوان تا سەردەمی بەسەر چوونی لەگەڵ پاشاکانی ئێران هەڵدەسەنگێنین و ئاماژەیان پێدەدەین کەلەم رۆژگارەدا چ کەسانێك لەپاشاکانی ئێران فەرمانڕەوایەتیان

کردووە.

لەرابردوودا ئاماژەمان پێدا بۆ کەسانێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل کەبخت النسر ئەوانی گرفتار کردبوو، گەڕانەوە بۆ بیت المقدس و ئەمە لەرۆژگاری کورش کوڕی ئەخشویرش و پاشایەتی ئەو لەلایەن بەهمەن لەبابل و چوار ساڵ لەمردنی ئەو لەرۆژگاری کچی بەهمەن خەمانا بوو. سەراسەری زەمانی وێرانی بیت المقدس لەو کاتەوەی بخت النسر وێرانی کرد، سەد ساڵی خایاند کە لەرۆژگاری بەهمەن وکچەکەی خەمانادابوو. هەواڵی تریشیان لەمبارەوە نوسیوە و جیاوازییەکان ئاماژەیان پێدرا. دەستەیەکیتر ئەم قسەیان بە ناراست زانیوە. کورش هیچ کات بەتەنیایی فەرمانڕەوایی نەکرد.

کاتێك بیت المقدس سەرلەنوێ ئاوەدان کرایەوە و خەڵکەکەی گەڕانەوە، عوزەیر لەناو ئەواندابوو. پاشای ئەوان لەلایەن ئێرانەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرد. ماوەیەك پیاوێکی ئێرانی و ماوەیەك پیاوێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل فەرمانڕەوایەتی دەکرد. بەمشێوە بوو تا فەرمانڕەوایی ئەو سەرزەمینە کەوتە دەست یۆنانییەکان و رۆمەکان وئەمە دوای دەرکەوتنی ئەسکەندەر و زاڵ بوونی بەسەر ئەو ناوچانەدابوو کەدارا کوڕی دارای کوشت. هەموو ئەم ماوەیە، بەوشێوەی هەندێك کەس ئاماژەیان پێداوە، هەشتاو هەشت ساڵ بوو.

## سەربووردەی کارەکانی دارای گەورە و کورەکەی دارای بچوك و چۆنییەتی لەناوچوونی ئەو

یەکێك لەپاشاکانی ئێران، دارا کوری بەهمەن کوڕی ئیسفەندیارە کەئەویان بەچهر ئازاد(جهر ئازاد، گەوهەر ئازاد) بەمانای چاك سرشت ناودەبرد.
ئەو لەبابل مایەوە. پاشایەك بوو بەهێزکەری ولآتەکەی خۆی و سەرکوتکەری پاشاکانی دەوروبەری خۆی. پاشاکان باجیان بەو دەدا. ئەو لەفارس شارێکی دروست کرد کەناوی نا دارابگەرد. ئەوچوارپێ ماڵییەکانی رازاندەوە. کورەکەی دارای زۆر خۆش دەویست ولەخۆشەویستی زۆر ناوی خۆی لەسەرنا وئەوی بۆ پاشایەتی دوای خۆی دیاری کرد.
رۆژگاری پاشایەتی ئەو بیست و دوو ساڵی خایاند.

دوای ئەو کوردەکەی دارا هاتە سەر تەخت و لەسەر زەمینی جزیرە لەنزیکی نەسیبین شاری دارای دروست کرد کەئێستا بەناوبانگە. پیاوێکی بۆ وەزیری خۆی دیاری کرد کەشیاو نەبوو و لەبەر ئەمە دڵی ئەوی لەهاورێکانی پیس کرد. پاشا سەردارانی سوپاکەی خۆی کوشت و گەورەکانی ولآت و جەماوەری خەڵك لێی ترسان. ئەو لاوێکی لەخۆرازی، ڕقاوی، یاخی، ستەمکار و ئەخلاق ناشیرین لەگەڵ خەڵکەکەی بوو.
سەردەمی پاشایەتی ئەو دوانزە ساڵی خایاند.

## داستانی ئەسکەندەری دووشاخ

فیلفوس (فیلقوس) باوکی ئەسکەندەری یۆنانی لەخەڵکانی شارێك بوو کەپێیان دەوت مەکدۆنییە. ئەو فەرمانڕەوایەتی ئەم شارە و شارەکانیتری دەکرد. ئەو لەگەڵ دارا لەسەر ئەم بنەمایە پەیمانی ئاشتی بەست کەساڵانە باج بۆ دەرباری دارا بنێرێت. کاتێك فیلفوس لەناوچوو، دوای ئەو ئەسکەندەر هاتەسەر تەختی پاشایەتی و بەسەر هەموو شارەکانی رۆم زاڵ بوو. هێزی ئەو لەدارا زیادی کرد و ئەو باجی بۆ دەرباری دارا نەنارد. دارا لێی تووڕە بوو و نامەی بۆ نوسی و سەرکۆنەی کرد کەرێگەی خراپەکاری گرتۆتەبەر و لەناردنی باجی ساڵانە خۆی دوورگرتووە. دارا سێ دیاری لەگەڵ نامەکەی نارد کەبریتی بوون لە(چۆگان، تۆپ و کویزی) و مەبەستی لەم سێ دیارییە ئەمەیە: ئەسکەندەر منداڵێك زیاترنییە و شیاوە بۆ ئەو ئێستا بەتۆپ و چۆگان گەمە بکات و واز لەپاشایەتی بێنێت وئەگەر نەیکات و نافەرمانی بکات، کەسێك دەنێرێت تا بەندی بکات.

ئەسکەندەر نامەی بۆ نوسی: لەمەبەستەکەی گەشتووە وئەوی لەنامەکەیدا بەجوانی سەیری کردووە و دەزانێت ماناکەی چییە. ئەو ئەمەی بەچاکە لێکداوەتەوە چوونکە کەسێك گەمە بەچۆگان دەکات هەڵیدەگرێت وئەو کەسەی وەرگرە، خۆی لێدوور دەخاتەوە و دەیگەرێنێتەوە بۆ ئەو کەسەی هاویشتوویەتی. ئەسکەندەر زەوی وەك تۆپ هەژمار دەکات و وڵاتەکەی دارا بەپاشکۆی وڵاتەکەی خۆی دەزانێت. ئەسکەندەر کیسەیەك خەردەلی بۆنارد و ئاگاداری کردەوە ئەوەی بۆی ناردووە، کەمە بەڵام توند و سوتێنەرە و لەشکرەکەی ئەسکەندەریش توند و سوتێنەرن. کاتێك دارا نامەکەی بەددست گەشت خۆی بۆشەڕ ئامادە کرد.

هەندێ لەئاگادارن لەبەسەرهاتی پێشینیان گومانیان بردووە ئەسکەندەرێك کە لەگەڵ دارا کوڕی دارا شەڕی کرد، برای دارای بچوکە کە لەگەڵ ئەودا شەڕی کرد و باوکی

دارای گەورە دایکی ئەسکەندەری وەك هاوسەر هەڵبژاردبوو. ئەو کچی پاشای رۆم بوو. کاتێك ژنەکەیان هێنایە لای ئەو لەبۆنی پیسی جەستەیی و ئارەقەی لەشی بێزار و فەرمانیدا چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە. باوەڕی کارزانەکان ئەوە بوو بەدارێك دەرمانی بکەن کە بەپارسی پێی دەڵێن سندەر. ژنیان بەناوی ئەو دارە شۆرد و زۆربەی بۆنی ناخۆشی جەستەی رۆشت. دواتر ئەوی بۆ لای بنەماڵەکەی گەڕاندەوە و ژنەکە لەمکاتەدا دووگیان بوو. ژن لەناو بنەماڵەکەی خۆی کورێکی هێنایە دنیا وئەوی بەناوی ئەو دارەی خۆی پێشۆردبوو، هاورێ لەگەڵ ناوەکەی خۆی ناونا. باوکی ئەو ژنە مرد و ئەسکەندەر دوای ئەو بەپاشایەتی گەشت ولەناردنی باجێك باوەگەورێی بۆ دەرباری دارای دەنارد خۆی دزییەوە. دارا کەسی نارد و داوای باجی کرد – و باج هێلکەی زێرین بوو- و ئەسکەندەر وەڵامی دایەوە: ئەو مریشکەی هێلکەی زێرینی دەکرد، سەرم بڕی و گۆشتەکەیم خوارد. ئەگەر دەتەوێت رێگەی ئاشتیت لەگەڵدا دەگرمەبەر و ئەگەر نەتەوێت لەرێگەی شەڕ روبەروی یەك دەبینەوە.

دواتر ئەسکەندەر لەشەڕ ترسا و خوازیاری ئاشتی بوو. دارا لەگەڵ هاورێکانی خۆی راوێژی کرد وئەوان بۆ شەڕ هانیاندا چوونکە دڵیان لەو رەش ببوو. لەمکاتەدا دارا بۆ شەڕ لەگەڵ ئەسکەندەر خۆی ئامادە کرد. ئەسکەندەر نامەی بۆ دووان لەدەرگاوانەکانی دارای نوسی و داوی لێکردن دارا بکوژن. ئەو دووانە دوو شتیان ویست بەڵام ئامازەیان بەدوورخستنەوەی خۆیان لەمەترسی نەکرد. کاتێك شەڕدەستی پێکرد، ئەو دوو دەرگاوانە دارایان کوشت. شەڕی نێوان ئەو دووانە یەك ساڵی خایاند. سوپای دارا تێکشکان و بڵاوەیان لێکرد و ئەسکەندەر لەدوایین ساتەکان هاتەسەر سەری.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نییە بەڵکو دووان لەپاسەوانەکانی لەخەڵکی هەمەدان بۆ رزگاربوون لەستەمکاری ئەو، ناکاوگیریان کرد و کوشتیان. هێرش کردنی بەنهێنی و لەناکاوی ئەو دووانە بۆسەر دارا کاتێك بوو سوپاکەی تێکشکابوو. ئەمە بەفەرمانی ئەسکەندەر نەبوو چوونکە ئەسکەندەر فەرمانی بەجارچییەکدا لەکاتی تێکشکانی

سوپاکەی دارا جار بدات کەدارا بەدیلی بگیرێت و نەکوژرێت. بەلأم ئەویان لەکوژرانی ئاگادار کردەوە. ئەسکەندەر هاتەسەر سەری و سەری خستە سەر رانی و وتی: هاورێکانی تۆ تۆیان کوشت ومن هەرگیز فەرمانی کوشتنی تۆم نەدا. هەرگیز نەمویست بەم شێوە بتبینم ئەی گەورەی گەورەکان، ئەی شای شاکان وئەی ئازادەی ئازادەکان. ئێستا چیت دەوێت داوا بکە. دارا داوای کرد کچەکەی رەوشەنەك بکاتە ژنی خۆی و رێزی لێبگرێت و پێگەی بەرز بنرخێنێت و ئازادەکانی ئێران زیندوو رابگرێت و تۆڵەی ئەو لەبکوژەکانی وەربگرێت.

ئەسکەندەر هەموو ئەو داواکارییانەی جێبەجێ کرد. دوو دەرگاوانەکەی دارای کوشت و پێش کوشتن بەو دووانەی وت: ئێوە کاتێك پەیمانتان بەست داوای گیانی خۆتان لەمن نەکرد. ئەسکەندەر پاداشتی ئەو دووانەی دا و دواتر هەردووکیانی کوشت. ئەسکەندەر وتی: بکوژانی پاشاکان ناتوانین بکوژین مەگەر بەپەیمانێك کەنەتوانین بیشکێنین. دیدار و شەڕی ئەو دووانە لەپانتاییەکانی خوراسان و لای خەزەر بوو. دەستەیەك دەڵێن لەسەرزەمینی جەزیرە لەولأتی دارا بوو.

پاشایەتی رۆم (یۆنان)پێش ئەسکەندەر بەربلأو بوو. لەسەر دەستی ئەسکەندەر کۆکرایەوە و پاشایەتی ئێران یەکپارچە و بەهاتنی ئەو بلأو بوویەوە. نوسراوەکان و زانستەکانی ئێرانی لەئەستێرەناسی و حیکمەتیان نیشانی ئەسکەندەردا و هەموویانی بۆ زمانی رۆمی وەرگێرایەوە.

ئێمە ئاماژەمان بەوان دا چوونکە وتیان ئەسکەندەر زڕبرای باوکی دارا بوو بەلأم رۆمیەکان و زۆربەی نەژاد ناسان گومان دەکەن ئەسکەندەر کوری فیلفوس و بەوتەی دەستەیەك فیلبووس کوڕی مەتریوس بوو. وتراوە کوری مسریم کوڕی هرمس کوڕی هردس کوڕی منتون کوڕی رۆمی کوڕی لیتی کوڕی یوناق کوڕی یافس کوڕی سۆبە کوڕی سرجون کوڕی رۆمیت کوڕی زنت کوڕی تۆقیل کوڕی رۆمی کوڕی ئەسفەر کوڕی ئەلیفزن کوڕی عەیس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم بوو.

ئەو دوای کوشتنی دارا وڵاتەکەی گرت و بەسەر عێراق و شام و رۆم و میسر و جزیرەدا زاڵ بوو. سوپاکەی خۆی بینی و ئەوانی هەزار هەزار و چوارسەد هەزار (یەك ملیۆن و چوارسەد هەزار) هەژمار کرد. لەنێوان ئەوان لە لەشکرییەکانی خۆی شەشسەد هەزار و لەسوپاکەی دارا شەشسەد هەزار. دوای هێرش کردنە سەر ئێران و داگیر کردنی قەڵاکانی، ئاتەشکەدەکانی وێران کرد و هیربدانی کوشت و کتێبەکانی سوتاند و پیاودکانی خۆی بۆ فەرمانرەوایی کردنی ئێران دانا. دووبارە دەستی بەپێشرەوی کرد و رۆشتە سەرزەمینی هیند و پاشاکەی کوشت و شارەکانی داگیر کرد و بتخانەکانی وێران کرد و کتێب و زانستەکانی سوتاند.

دواتر لەوێوە بەرەو چین رۆشت و کاتێك گەشتە ئەو وڵاتە، دەرگاوانەکەی شەوانە هاتەسەری و وتی: پەیکی پاشای چین هاتووە. ئەسەندەر بانگی کرد و فەرمانیدا ئەو لەگەڵ ئەودا بەتەنیا جێبێڵن. ئەو پەیکە گەڕان و هیچیان لێنەدۆزییەوە. ئەو کەسانەی لای ئەسکەندەر بوون رۆشتنە دەر و ئەو پیاوە وتی: من پاشای چینم و هاتووم لێت بپرسم چیت دەوێت و دەتەوێت چی بکەیت تا ئەگەر بتوانین خواستەکەی تۆ بەجێبێنین و رێگری لەشەڕ بکەین. ئەسکەندەر وتی: چۆنت زانی زیان بەتۆ ناگەینم؟ پاشای چین وتی: زانیم تۆ بیرمەند و فرمزانیت و لەنێوان من و تۆ دوژمنی نییە. تۆیش دەزانی ئەگەر من بکوژیت کوژرانی من نابێتە هۆی ئەوەی چینییەکان وڵاتەکەیان بەتۆ بسپێرن. ئەوسا ئەگەر من بکوژی تۆ بەناجوامێر بانگ دەکەن.

ئەسکەندەر زانی پیاوێکی بیرمەندە و لەبەر ئەمە پێی وت: لەتۆ داهاتی سێ ساڵی وڵاتەکەتم دەوێت هەر ئێستاکە و نیوەی داهاتەکەت هەموو ساڵێك. پاشای چین وتی: رازیم بەڵام لەمن بپرسە چۆنیت؟ ئەسکەندەر وتی: چۆنیت؟ پاشای چین وتی: یەکەم کوژراو بۆ شەڕ و یەکەم. خواردن بۆ دڕندەکان. ئەسکەندەر وتی: ئەگەر بەداهاتی دو ساڵ بەسەندە بکەم؟ پاشای چین وتی: رۆژگارم کەمێك باشتر دەبێت. ئەسکەندەر وتی: ئەگەر بەداهاتی ساڵێکت بەسەندە بکەم؟ پاشای چین وتی: وڵاتەکەم دەڕوات و خۆشیەکانیشم لەدەست دەچێت. ئەسکەندەر وتی: من ئەوەی وتم، بەتۆ دەسپێرم و یەك لەسەر سێی داهاتی هەر ساڵێکت لێ دەستێنم. ئێستا

چۆنیت؟ پاشای چین وتی: یەك لەسەر شەش بۆ هەژاران و نەداران و هەزینەکانی وڵات، یەك لەسەر شەش بۆ من، یەك لەسەر سێ بۆ سوپا ویەك لەسەر سێ بۆ تۆ. ئەسکەندەر وتی: لەمە بەتۆ شادمانم. ئەوسا سپاسی کرد و لای ئەسکەندەر گەرایەوە. سوپاییەکان ئەمەیان بیست و لەئاشتی شادمان بوون.

کاتێك بەیانی هەتاو هەڵهات        پاشای چین بە پەلە داوان هات

ئەو بەسوپایەکی قورسەوە هات و سوپاکەی ئەسکەندەری گەمارۆدا. ئەسکەندەر سوار بوو و خەڵك سوار بوون. پاشای چین سوار لەسەر فیل بەتاجێك کە لەسەریدا بوو دەرکەوت. ئەسکەندەر پێی وت: فریوت دام؟ پاشای چین وتی: نا بەڵام ویستم بزانیت لەناتەوانییەوە فەرمانبرداری تۆم نەکرد. بینیم ئەم دنیا گەورەیە روی لەتۆیە و منیش ویستم بە فەرمانبردنی تۆ روو لەدنیا بکەم. لەتۆ نزیك بوومەوە تا لەجیهانی لەپێش نزیك ببمەوە. ئەسکەندەر وتی: لەسەر پیاوێکی وەك تۆ باج دانانێن. من لەنێوان تۆ و خۆم لەپێشیم نەبینی و هاوشێوەی بیرمەندەکان تۆم بینی. هەموو ئەو شتانەی لەتۆ داوام کردبوو بەخشیم و ئێستا لەولاتەکەی تۆ دەگەڕێمەوە. پاشای چین وتی: زەرەرت نەکرد. ئەو بۆ ئەسکەندەر دوو بەرابەری ئەوی پەیمانیان بەستبوو، ڕەوانەی کرد. ئەسکەندەر هەر ئەو کات لەوێ دوور کەوتەوە و بەم شێوەیە هەموو خەڵکانی سەر زەوی لەرۆژ ئاوا تا رۆژهەڵات ملکەچی بوون و پاشاکانی تبت و پاشاکانیتر ملیان بەفەرمانی ئەودا.

کاتێك لەرۆژئاوا و رۆژهەڵات تەواو بوو وسەرزەوینەکانی نێوانیانی داگیر کرد، ویستی بەرەو باکور بڕوات و هەموو خەڵکانی ئەوێ سەریان بۆ فەرمانەکانی دانەواند تا ئەوەی گەشتە وڵاتی یاجوج و ماجوج. گفتوگۆ لەمبارەوە زۆرە و جیاوازییەکان فراوان. وتەی راست ئەوەیە کەئەوان لەنەژادی تورکەکانن، شکۆ و هێزیان هەیە و خراپەکاری لەگەڵیا. ژمارەیان زۆرە. ئەوان لەسەرزەمینەکانی دراوسێ خراپەکاریان دەکرد و هەرشوێنێك دەیانتوانی وێرانیان دەکرد و نزیکەکانی خۆیان ئازار دەدا. خوا

داستانی ئەوانی بەم شێوەیە گێراوەتەوە(ئێمە هەموو بەسەرهاتەکانی قورئان لەبارەی دوشاخ باس دەکەین چوونکە هەمووی داستانەکان لەسەر بنەمای ئەمە وتراون و هەموویان لەمەوە سەرچاوە دەگرن: خەڵك لەبارەی دوو شاخ پرسیارت لێدەکەن. بڵێ ئێستا یادێکی بۆ ئێوە دەخوێنمەوە. ئێمە لەسەر زەوی توانایی و هێزمان پێبەخشی و لەهەر شتێك زانست و زانیارییەك. ئەو بەدوای ئەو زانستانە وەك ڕێبواران بەرێکەوت. کاتێك گەشتە ئاوابوونی خۆر، هەتاوی بینی لەکانیاوێکی گەرمدا ڕۆدەچێت. لەوێ خەڵکانێکی بینی. وتمان: ئەی دووشاخ، هەم دەتوانیت ئەشکەنجەیان بکەیت و هەم دتوانیت بەباشی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەیت. وتی: ئێمە ئەو کەسەی ستەمکار بێت ئەشکەنجەی دەکەین و ئەو دواتر دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و ئەو ئەشکەنجەکانی دژوارە. بەڵام ئەو کەسەی باوەڕ بەخوا بێنێت و چاکە بکات، شیاوە بۆ پاداشتێکی چاك و ئێمە لەکاری خۆمان چاکەی دەخەینە بەردەم. ئەوکات بۆ چارە دۆزینەوە وەستا. کاتێك گەشتە شوێنی هەڵاتنی خۆر، هەتاوی بینی لەخەڵکانێك دێتەدەر کەئێمە جگە لەڕووناکی خۆر پۆششێکمان بۆ دروست نەکردوون. بەمشێوەیە و ئێمە لەهەموو زانستەکانی ئەو ئاگادار بووین و دەمانزانی. ئەوسا بۆ چارە دۆزینەوە وەستا. کاتێك گەشتە نێوان دو هەوراز، خەڵکانێکی بینی بەدژواری دەیانتوانی لەقسەی کەسانیتر بگەن. ئەوان وتیان: ئەی دووشاخ، یاجووج و ماجووج لەسەر زەوی خراپەکارانن. ئایا دەتەوێت هەزینەکەیت بۆ کۆبکەنەوە تا لەنێوان ئێمە و ئەوان دیوارێکی بەرز دروست بکەیت؟ وتی: ئەو هێز و تواناییەی خوا بەمنی بەخشیوە باشترە. ئێوە من بەپیاوان هاوکاری بکەن تا لەنێون ئێوە و ئەوان دیوارێك دروست بکەم زۆر بەرز و بەهێز. پۆڵا و ئاسن بدەن بەمن. کاتێك لەسەر زەوی تا سەر کێوی تەخت کرد، وتی: فوی تێبکەن، تا ئەو کاتەی ئاگرێکی خۆش کرد و ئاسنی سوور کردەوە و وتی: مسی تواوەم پێبدەن تا بیکەمە سەر ئەمە. لەو بەدوا ئەوان نەیانتوانی بێنەسەر دیوار و نەیانتوانی کونی بکەن(کهف/٨٣/١٨—٩٧).

ئەوسا وتی(توانای خوا زیاتر و باشترە)، لەم ڕێگاوە بوو کە: بەخشینەکانی خوا باشترە لەهەزینەکانی ئێوە بۆمن بەڵام من بەپیاوان و ساز وبەرگ و کەرەستەکانی

دروست کردن هاوکاری بکەن. ئەوسا وتی: بۆمن خاوەکانی ئاسن بێنن. یانی پارچەی ئاسن بێنن. بۆیان هێنا. ئەو پایەکانی هەڵکەند تا گەشتە ئاو و دواتر ئاسن و داری چین لەسەر چین لەسەر یەك دانا تا نێوان دوو هەورازەکەی تەخت کرد. ئەو ئاگری خستە ناو دارەکە و ئاسن سوربوویەوە و ئەمە مسی سورکراوە بوو. جێگەی داری پڕکردەوە و ئەو دیوارە سەخت و ئەستوور، وای لێهات دەتوت چنراوێکی ڕەنگاو ڕەنگە کە تیایدا سوری مسە و ڕەشایی ئاسن. ئەو لەسەرەوە شوێنی ئاسنینی دروست کرد و یاجوج و ماجوج لەڕۆشتن بۆ وڵاتانی دراوسێ مانەوە بەوشێوەی کەخوا دەفەرمێت: ئەتوانیان بڕۆنە سەری و ئەتوانیان کونی بکەن.

کاتێك لەکاری دروست کردنی ئەو دیوارە تەواو بوو، ڕۆشتە ناو تاریکییەکان کە لەولای جەمسەری باکوڕە و خۆر لەباشوریەتی و لەبەر ئەمەیە، سەرتاسەری تاریك بوو. کاتێك ڕۆشتە ناو تاریکییەکان، چوارسەد لەپیاوانی خۆی هەڵگرت و بە دوای کانی ژیانی جاویدان گەڕا. هەژدە ڕۆژ لەناو تاریکییەکان بەرێگادا ڕۆشت بەڵام ئەو کانییەی نەدۆزییەوە و لێی هاتەدەر. خزر فەرماندەی پێشڕەوەکانی بوو، کانییەکەی دۆزییەوە و مەلەی تیا کرد و لێی خواردەوە. و خوا زاناترە.

ئەو بۆ عێراق گەڕایەوە و لەشارەزور بەنەخۆشی قۆرگ ئێشە، مرد. ڕۆژگاری ژیانی ئەو سی و شەش ساڵ بوو و ئەمە بەوتەی دەستەیەك لەکەسەکانە. ئەویان کردە ناو تابوتیکی زێرین و ڕازاوە بەگەوهەرەکان. تابووتەکەیان بە سەبر سوو (تا لەناو نەچێت) و بردیانەوە بۆ دایکی.

ئەو چواردە ساڵ پاشایەتی کرد. دارا لەسێیەم ساڵی پاشایەتی ئەودا کوژرا. ئەو دوانزە شاری دروست کرد لەوانە: ئیسفەهان کەپێیان دەوت جی، هەرات، مەرو، سەمەرقەند، شارێك لەسواد بۆ ڕەوشەنەك کچی دارا، شارێك لەیۆنان و ئەسکەندەریە لەمیسر.

کاتێك ئەسکەندەر مرد، هاوەڵەکانی لەفرەزانەکانی ئێرانی و یۆنانی و هیندی دەوریان گرت. ئەوانی کۆدەکردەوە و لەوتاری ئەوان ئارامی پێدەبڕا. ئەوسا لەدەوری پەیکەرەکەی ئەو کۆبوونەوە. گەورەکەیان وتی: هەر کام قسەیەك بکەن تا بۆ کەسە تایبەتییەکان ببێتە هۆی دڵدانەوە و بۆ هەمووان هۆکارێك بۆ وشیاری. ئەو دستی خستە سەر تابووت وتی: دیلکەری دیلەکان دیل کرا. یەکێتر وتی: ئەم پاشایە زێری کۆدەکردەوە و ئێستا زۆر ئەوی کۆکردەوە. یەکێتر وتی: خەڵك لەم پەیکەرد رادەکەن و بەرەو زێرەکانی تابووت دەڕۆن. یەکێتر وتی: سەرسورهێنەرترین سەرسورهێنەر ئەوەیە بەهێز سەرکوت کراوە و ناتەوانەکان سەرقاڵی گەمە کردنن. یەکێتر وتی: ئەمە ئەو کەسەیە ڕۆژی کۆتایی خۆی شاردەوە و ئارەزووەکانی ئاشکرا کرد. بۆ ڕۆژی کۆتایی خۆت دوانەخست تاکەمێك لەئارەزووەکانت بگەشتیتایە؟ بەڵکو دەبێت بووترێت: بۆ ئارەزووەکان خۆت سوك نەکرد تا پەیمانەکەت بەم زوانە پڕنەبێت؟ یەکێتر وتی: ئەی تێکۆشەر، شتێکت کۆکردەوە لەکاتی پێویست فریات نەکەوت. بارە قورسەکان لەسەر شانی تۆ مایەوە و تۆ دەستت لەگوناحەکانیدا. بۆ یەکێترت کۆکردەوە و گوناحەکەیت لەسەر خۆت نوسی. یەکێتر وتی: تۆ ئامۆژگارییکەری ئێمە بوویت و ئێستا ئامۆژگارێك باشتر لەمەرگی تۆ نییە. ئێستا هەر کەسی خاوەن ئاوەز دەبێت وانە وەربگرێت و هەر کەس وانەوەرگر بێت، دەبێت رازی بێت. یەکێتر وتی: زۆر بوون ئەوکەسانەی لەپشت سەرت بوون و لێت دەترسان و ئێستا لەبەردەم تۆیە و ترسی نییە. یەکێتر وتی: زۆر کەس ئارەزوومەندی بێدەنگ بوونی تۆ لەکاتی قسەکردندا بوو و ئەمرۆ کەبێدەنگی، ئارەزوومەندی قسە کردنتە. یەکێتر وتی: ئەم پیاوە کەسی زۆری مراند تا نەمرێت و ئێستا مەرگ هەمووشتێکی لێ سەندوە. یەکێتر وتی: بەردەوام داوات لەمن دەکرد لێت دوور نەکەومەوە و ئێستا منم ئامەوێت لێت نزیك ببمەوە. یەکێتر وتی: ئەمرۆ ڕۆژێکی گەورەیە کەخراپە هەڵاتووەکانی رویان تێکرد و چاکە بەپەلەکانی لێی هەڵاتن. هەر کەس بیەوێت لەسەر ونکەری پاشایەتی خۆی بگریت دەبێت قاقا بگریت. یەکێتر وتی: ئەی هەڵگری پاشایەتی بەهێز. پاشایەتییەکەت ڕۆشت بەو شێوەی هەور دەڕوات و ئامێنێت و شوێن پێکانت داپۆشرا وەك شوێن پێکانی مێشێك. یەکێتر وتی: ئەوی ئەو کەسەی

درێژی و پانی زەویت لا تەنگ بوو، خۆزگە دەمزانی ئێستا لەم شوێنە تەنگەدا چۆنیت! یەکێتر دەیوت: سەرسوڕماوم لەو کەسەی کۆتای ڕێگەکەی ئەمە بوو، چۆن خۆی بۆ کۆکردنەوەی خواستە فیرۆکان و کەڵەکە کردنی ئەو شتانەی وەك کا گیرۆدەی بای لەناوچوون دەبن، خستە ڕەنجەوە و خۆی کردە وێردی زمانی ئەم و ئەو. یەکێتر دەیوت: ئەی کەسانی کۆری مەزن، دڵ بەشتێك مەبەستن کەشادمانییەکەی هەمیشەیی نییە و لەیەك ساتدا کۆتایی دێت. ئێستا بۆ ئێوە ڕاستی و دروستی لەنەزانی و گومڕایی جیابوویەوە و دەرکەوت. یەکێتر دەیوت: ئەم پاشای ڕابردووەتان بینی، ئێستا شیاوە پاشای داهاتوو وانەی لێوەربگرێت. یەکێتر دەیوت: ئەی ئەو کەسەی تووڕە بوونت هۆکاری مەرگ بوو، بۆ لەمەرگ تووڕە نەبوویت؟ یەکێتر دەیوت: ئەو گوێچکەکانەی قسەکانیان دەبیست، بێدەنگ بووە تا قسەی کەسانیتر ببیستێت. یەکێتر دەیوت: بەم زووانە دێتە لای تۆ ئەو کەسەی مەرگی تۆ شادمانی کرد بەهەمان شێوە کەتۆ ڕۆشتیتە لای ئەوانەی مەرگیان تۆی شادمان کرد. یەکێتر دەیوت: ئەی هەڵسوڕێنەری سەر زەوی، بۆ هیچ ئەندامێك هەڵناسوڕێنیت؟ بەڵکو دەبێت بڵێین: بۆ گلەیی لەتەنگانەکان ناکەیت کەهەمیشە لەفراوانی گلەییت بوو. یەکێتر دەیوت: ئەو دنیاییە کۆتاییەکەی ئەمە بێت، باشتر وایە لەسەرەتاوە پشتی تێبکەن.

خوان سالاری ئەو وتی: جێگەکانم ڕاخست و سفرەکانم چنی، بەڵام ئێستا کەس نابینم. خەزێنەدارەکەی وتی: منت بۆ پاشەکەوت کردن فەرمان دەدا، ئێستا پاشەکەوتەکانت بەکێ بسپێرم؟

یەکێتر دەیوت: ئەم دنیا پان و بەرینە جگە لەحەوت بستی بۆ تۆ بەجێنەهێشت، بێ گومان ئەگەر ئەمەت دەزانی، لەگەڕانی زۆر کەمت دەکردەوە.

ڕەوشەنەك هاوسەرەکەی وتی: گومانم نەدەکرد سەرکوتکەری دارا سەرکوت بکرێت، ئەو قسەی لەئێوە بیستم، سەرکۆنە بوو. ئەو دەفرێك کەتیایدا دەیخواردەوە، بەجێیهێشت، ئێستا دەبێت ئەو دەستە لێی بخۆنەوە. کاتێك دایکی لەمەرگی ئاگادار بوویەوە، وتی: ئەگەر فەرمانی کوڕەکەم ئەنجام نەدا، بیریم لەدڵ دوور نەکرد.

ئەمە قسەی فرەزانەکان لەبارەی ئەو بوو. ئامۆژگاری و وانەی تیایە و لەبەر ئەمە ئاماژەمان پێدا.

لەفێڵەکانی ئەسکەندەر لەشەڕەکانی یەك ئەوەبوو، کاتێك روبەروی دارا بوویەوە، هاتە ناو دوو لەشکرەکە و جارچییەکی فەرموو جاربدات: ئەی ئێرانییەکان، خۆتان دەزانن چیتان بۆ من نوسیوە و ئێمە چۆن ئەمانمان بۆئێوە نارد. هەرکەس لەسەر بەڵێنەکەی ماوە، خۆی لەشەڕ دوور بخاتەوە تا بەڵێنداری لەئێمەیش ببینن. ئێرانییەکان گومانیان لەیەکتر کرد و پەرێشان بوون.

لەفێڵەکانیتری ئەوە بوو کەپاشای هیندستان بەفیلە شەرکەرەکان روبەروی بوویەوە و ئەسبەکانی ئەسکەندەر رەمیان کرد. ئەو دەستی لەو شەڕە هەڵگرت و فەرمانیدا چەندین فیل لەمس دروست بکەن و بەساز وبەرگ پۆشتەیان بکەن و ئەوانیان لای ئەسبەکان راگرت تا ئەسبەکان ئاشنایان بوون.

دواتر بۆ هیند گەرایەوە. پاشای هیند روبەروی بوویەوە. ئەسکەندەر فەرمانیدا ناوی ئەو فیلانە لەشقاتە ونەوت پڕبکەن و سوار لەسەر عەرەبانەکان هێنایانە ناو گۆرەپانی شەڕ و پیاوە شەرکەرەکانیان لەگەڵ نارد. کاتێك شەڕ دەستی پێکرد فەرمانیدا فیلەکان ئاگرتێبەربدەن و کاتێك توانەوە پیاوە شەرکەرەکان و فیلدارەکان بلاوەیان لێکرد. فیلە هیندییەکان گەمارۆیان دا و بەلوتی خۆیان لێیان دەدا و هەموویان سوتان و بەردو هیند رایان کرد و خەڵکیش لەبەردەمیانا بەهەڵە داوان رایان دەکرد.

یەکیتر لەفێڵەکانی شەڕی ئەو ئەمەیە: گەمارۆی شارێکی بەهێزی دا کەخواردن و کانی ئاوی فراوانی بوو ( و ئەو نەیتوانی دیوارەکانی شار داگیر بکات). گەرایەوە و ژمارەیەکی وەك بازرگان نارد کەکاڵایان پێ بوو و دەیانفرۆشت. فەرمانی پێدان هەرچەندە دەتوانن خواردن بکرن و پارەی زۆر بدەن وکاتێك خواردنییەکانیان کۆکردەوە، بیسوتێنن و هەڵبێن. ئەم کارەیان کرد و هەڵاتن. ئەو دەستە شەڕکەرەکانی بۆ دەرەوەی شار نارد کە بەردەوام هێرشیان دەکرد و تالأنیان دەکرد. خەڵکی شار رایان کرد و هاتنە ناو شار تا پەنا بگرن. ئەسکەندەر هێرشی کردە

سەریان و ڕێگەی ڕۆشتنە ناو شار گراوە بوو.

ئەو بۆ **ارسطاطاليس** (**ارسطو**)ی نوسی کە لەناو گەورەکانی ڕۆم، دەستەیەك هەن کەئەوان ئارمانی گەورە و گیانی گەورە و دڵی ئاشنا بەترسیان هەیە. ئەو لەوان لەگیانی خۆی دەترسێت بەڵام نایەوێت ئەوان لەسەر گومانی خۆی لەناو بەرێت. **ارسطاطاليس** لەوڵامدا بۆی نوسی: نامەکەی تۆم خوێندەوە و تێگەشتم. ئەوەی سەبارەت بەخەیاڵپەردازی ئارمانەکانی ئەوان باست کرد(ڕاستە بەڵام دەبێت بزانیت کە) ئەمەکداری بەرهەمی ئارمان و گەورە بوونی گیانە و فێل لەتایبەتمەندیەکانی پەستی و ریسواییە. بەڵام لەبارەی ئازایەتی و نەزانی ئەوان، هەرکەس عادەتی بەمشێوە بێت، ژیانیان بۆ فراوان بکە و ژنە جوانەکان بکەرە هاوئامێزیان، چوونکە فراوانی و ئاسودەی ژیان ئازایەتی لەناو دەبات و خوازیاری بوونی تەندروستی لێدەکەوێتەوە. ئاگاداربە دەستت بەمرۆڤ کوشتن پیس نەکەیت چوونکە ئەمە هەڵەیەکە چارەی نییە و تاوانێکە نابەخشرێت. سزا بدە بێ کوشتن تا لەسەر بەخشین بەتوانا بیت چوونکە بەخشین لای بەتواناکان زۆر جوانە. دەبێت کردەوەی تۆ چاك بێت تا خواستەکان یەکسەرە ببنە هاورێی تایبەتی تۆ. بەهۆی توانایتەوە خۆت بەگەورەتر لەهاورێکانت مەزانە چوونکە هەر کەس نابەرابەری بکاتە پیشە و شتەکان تایبەت بکات بەخۆی، هاورێکانی لێ بێ بەش دەکات و هەرکەس یەکسانی و لەخۆبووردوی بکاتە پیشە، ریشە دوژمنی دەردەکێشێت.

دووبارە کاتێك سەرزەمینی ئێرانی گرتەوە، بۆ **ارسطاطاليس** ی نوسی: من لەئێران خەڵکانێکم بینی خاوەن بیرورا، سەرسەخت و زۆر بوێر و جوانی ونەژادی بەرز و شاهانە. من لەرێگەی دادپەروەریەوە بەسەر ئەواندا زاڵ بووم بەڵام دەترسم کاتێك لێیان دووربکەومەوە و وڵاتیان پێبسپێرم، شۆرش بکەن و فەرمانەکانی من پشت گوێ بخەن ولەبەر ئەمە تەنیا بە لەناوبردنیان دەتوانم زیانی ئەوان لەناو ببەم. ئەو بۆی نوسی: نامەی تۆم لەبارەی خەڵکی ئێران خوێندەوە و تێی گەشتم. بەڵام کوشتنی ئەوان کارێکە لەسەر بنەمای ستەمکاری و دەبێتە هۆی لەناوچوون کە لەئەنجامە

خراپەکانی ناتوانین خۆمان بەدوور بگرین. ئەگەر ئەوان کوشتار بکەیت، خەڵکانی نێران کەسانی وەك ئەوان دێننە سەر کار و بەناچار هەموو خەڵکی وڵات دەبنە دوژمنی تۆ و کینەی منداڵەکانی تۆ لەدڵ دەگرن و تۆ لەهەمان کات لەدەرەوەی شەڕ، ئەوانت بە کوشت داوە. بەڵام دەرکردنی ئەوان لەسوپاکەت، دەبێتە هۆی زیان گەشتن بەخۆت و سوپاکەت. من ڕێگایەکت نیشان دەدەم کەباشتر لەکوشتنە. شازادەکان و ئەو کەسانەی شیاو نین بۆ پاشایەتی، بانگ بکە و شارەکان بەوان بسپێرە و هەرکام بکەرە پاشایەکی جیاواز تا بەم شێوەیە وتاریان یەك نەبێت و زیانیان بەرخۆیان کەوێت و لەسەر فەرمانبردن و هاورێیەتی هاودەست بن وخۆیان بەپەروەردە کراوی تۆ هەژمار بکەن. ئەسکەندەر ئەم کارەی کرد و پاشایەتی تیرە و تایەفەکان لێرەوە دروست بوو. لەبارەی هۆکاری دروست بوونی پاشای تیر و تایەفەکان شتیتریش ئاماژەی پێدراوە کە بەخواستی خوا ئاماژەیان پێدەدەین.

## پاشاکان دوای ئەسکەندەر

کاتێك ئەسکەندەر مرد، پاشایەتیان دا بەکورەکەی ئەسکەندەرون، بەلام ئەو پێی رازی نەبوو. لەبەر ئەمە پاشایەتی یۆنان بەو شێوە هەندێ کەس ئاماژەیان پێداوە، بەبتلیموس کوڕی لاغوس گەشت و رۆژگاری پاشایەتی ئەو سی و هەشت ساڵ بوو. ئەوسا پاشایەتی سەرزەمینی یۆنان بەمشێوە درێژەی پێدرا: بتلیموس فیلوزفوس بیست و یەك ساڵ، بتلیموس ئەوراغاتس بیست و چوار ساڵ، بتلیموس فیلافتر بیست و یەك ساڵ، بتلیموس ئەفیفانس بیست و دوو ساڵ. بتلیموس ئەوراغاتس بیست و نۆ ساڵ، بتلیموس ساتر حەفدە ساڵ، بتلیموس ئەخشەندەر بیست و یەك ساڵ. بتلیموسێك کە لەسەر تەختی پاشایەتی خۆی دوور خستەوە و دیار نەما هەشت ساڵ و خاتونێك بەناوی قالو بترى حەفدە ساڵ. ئەم ژنە لەفرەزانەکان بوو و ئەمانە هەمووی خەڵکانێك لەیۆنان بوون. هەموو ئەو کەسانەی دوای ئەسکەندەر بەپاشایەتی گەشتن، بەبتلیموس ناودەبرێن بەو شێوەی کەپاشاکانی ئێرانیان بەخوسرەو ناودەبرد و پاشاکانی رۆم بە قەیسەر.

دوای ئەوە قالبترى پاشای رۆم وەك پاشای رۆم هەڵبژێردرا و یەکەم کەس لەم بنەماڵەیە هاتە سەرتەخت، جایوس یولوس بوو کەپێنج ساڵ فەرمانرەوایی کرد. دوای ئەو ئەغستوس کەپەنجا و شەش ساڵ پاشایەتی کرد و کاتێك چل و دو ساڵ لەفەرمانرەوایەتی تێپەری کرد، عیسی کوڕی مریەم لەدایك بوو. دەڵێن لەنێوان لەدایك بوونی عیسی و هاتنە سەر کاری ئەسکەندەر سێسەد و سێ ساڵ بوو(٣٣٦) بوو.

## بەسەرهاتی کاری پاشاکانی ئێران دوای ئەسکەندەر
## پاشاکانی تیرە و تایەفەکان

کاتێك ئەسکەندەر مرد، دوای ئەو پاشاکانی تیرەکان بوونە پاشا و ئاماژە پێدا. دەستەیەك دەڵێن: هۆکار ئەوە بوو کاتێك ئەسکەندەر بەسەر ئێراندا زاڵ بوو و ئەوەی دەیویست بە دەستی هێنا، نامەی بۆ **ارسطاطالیس** نوسی: من هەموو پاشماوەکانی رۆژهەڵات زەمینم ترساند و ئازارم دان و ئێستا ترسی ئەوەم هەیە دوای من یەك دەست بن و یەکبگرن و بیانەوێت هێرش بکەنە سەر وڵاتەکەی ئێمە و خەڵکانی ئێمە ئازار بدەن. بریارم دا منداڵانی باوك کوژراو لەشازادەکان بکوژم و بیانێرم بۆ لای باوکیان. تۆ لەم کارەدا چی دەبینیت؟

ئەو وەڵامی دایەوە: ئەگەر شازادەکان بکوژیت کار دەکەوێتە دەست نەزان و ژێردەستەکان ونەمانە کاتێك ببنە پاشا و هێز پەیا بکەن، یاخی دەبن و ستەم دەکەن. زیانێك لەوان دەگات زیاتر دەبێت. باوەڕی راست ئەوەیە شازادەکان کۆبکەیتەوە و هەر کام بۆ پاشایەتی شار و بەشێك دیاری بکەیت و کاتێك ئەمە بکرێت هەرکام روبەروی ئەویتر دەبێتەوە تا ئەو لەگەشتن بەخواستەکەی دوور بکاتەوە و بەمشێوە لەناو ئەوان دوژمنی دروست دەبێت و سەرقاڵی یەك دەبن و کاتی ئەوەیان نابێت لەگەڵ دووردەستەکان دوژمنی بکەن.

لەمکاتەدا بوو ئەسکەندەر وڵاتەکانی رۆژهەڵاتی بەسەر پاشای تیرە و تایەفەکان دابەش کرد و ئەستێرەناسی و زانایی لەوڵاتی ئەوانەوە بۆ شوێنێکیتر برد و ئەوە رویدا کە **ارسطاطالیس** پێشبینی کردبوو. پاشاکانی رۆژهەڵات سەرقاڵی یەکتر بوون و شەڕیان لەگەڵ یۆنانییەکان نەکرد.

**ارسطاطالیس** بەرزترین و فرەزانترینی زاناکان بوو. ئەسکەندەر لەگەڵ ئەو راوێژی دەکرد و وتەکانی بەکار دەبرد. **ارسطاطالیس** (٣٨٤—٣٢٢ پ.ز) زانستی

لەئەفلاتون(٤٢٧—٣٤٧پ.ز) قوتابی سوقرات (٤٦٩—٣٩٩ پ.ز) خوێند و سوقرات تەنیا لە**طبیعیات** قوتابی ئوسیلاوس بوو. ئوسیلاوس قوتابی ئەنکساغورس (ئانا کساگوراس، دەوروبەری ٤٢٨ پ.ز) بوو. **ارسطاطالیس** لەچەند پرسێکدا ڕێگای ناسازگاری لەگەڵ مامۆستاکەی گرتەبەر و کاتێك لەمبارەوە لێیان پرسی، وتی: ئەفلاتونم خۆش دەوێت و هەروەها ڕاستی و دروستیش، بەڵام ڕاستی و دروستیم زیاتر خۆشدەوێت.

زاناکان لەبارەی پاشایەك کە دوای ئەسکەندەر لە سوادی عێراق بوو و لەبارەی ژماری پاشای تیرەکان کە فەرمانڕەوایی هەرێمی بابلیان کرد، بیروراکانیان جیاوازە. هشان کوڕی کەلبی و کەسانی هاوبیروڕای نوسیویانە: دوای ئەسکەندەر بلاقس سلبقس و دواتر ئەنتیخس (ئانتیوخس) دامەزرێنەری شاری ئەنتاکیە (ئانتیوخ) فەرمانڕەوایەتیان کرد و سوادی کوفە بۆ پەنجا و چوار ساڵ لەدەست ئەواندا بوو و ئەوان لە پانایییەکانی فارس و ئەهواز و کوێستانەکان هاتوچۆیان دەکرد و بوویان.

## پاشایەتی ئەشك كوڕی ئەشكان

دواتر پیاوێك بەناوی ئەشك (یا ئەرشەكی یەكەم ٢٥٠—٢٤٨ پ.ز) قوتبوویەوە. ئەو كوری دارای گەورە بوو و زادگا و شوێنی گەورە بوونی شاری رەی بوو. دەستەیەكی زۆر كۆكردەوە و رەوانەی شەڕ لەگەڵ ئەنتیخس بوو و ئەنتیخس روبەروی وەستایەوە و ئەم دووانە لەسەرزەمینی موص بەیەك گەشتن. ئەنتیخس كوژرا و ئەشك بەسەر سواد زاڵ بوو و لە موسڵ تا رەی و ئیسفەهانی گرت و پاشاكانیتر بۆ رێز گرتن و گەورەیی بەگەورەیان هەژمار كرد و نامەكانی خۆیان بە ناوی ئەو دەسپێدەكرد و بەشای شاكان ناویان دەبرد بێ ئەوەی بتوانێت هیچ كام لەوان لەسەر كار لابرێت. دوای ئەو كورەكەی شاپور كوڕی ئەشك هاتە سەر تەختی پاشایەتی.

## پاشایەتی گودەرز

دوای ئەو گودەرز کوڕی ئەشکان لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و ئەو کەسەیە بۆ جاری دووەم لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل شەڕی کرد.
هۆکاری زاڵ بوونی گودەرز بەسەر منداڵەکانی ئیسرائیل کوشتنی یەحیا کوڕی زەکەریا بوو. گودەرز زۆر لەوانی کوشت و دوای ئەو ئەیانتوانی وەك رابردوویان لێبێتەوە و خوا پێغەمبەرایەتی لەناو ئەوان هەڵگرت و ریسوای کردن. دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل دا شەڕی کرد تیتوس کوڕی ئسفیانوس پاشای رۆم بوو. ئەوانی کوشتار کرد و بە دیلی گرتن و بیت المقدسی وێران کرد.
رۆمیەکان بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئانتیوخوس هێرشیان کردبووە سەر وڵاتی ئێران و پاشای بابل لەم کاتەدا بلاش باوکی ئەردەوان بوو کە بەدەستی ئەردەشیر کوڕی بابەك کوژرا. بلاش بۆ پاشای تیرەکان نامەی نوسی و ئاگاداری کردنەوە کە رۆمیەکان بۆ هێرش کردنە سەر وڵاتەکەیان یەکیان گرتووە و سوپایەکی گەورەیان رێکخستووە و ئەگەر ئەو لەبەرابەر ئەوان بکەوێتە سەر چۆك، بەسەرهەموویاندا زاڵ دەبێت.
هەرکام لەپاشای تیرەکان بەئەندازەی توانایی خۆی پیاوی شەڕکەر و کەرستەی نیزامی نارد و لای ئەو نزیکەی چوارسەد هەزار پیاوی شەڕکەر کۆبوونەوە. ئەو فەرمانرەوای (خزر)(شارێك بەرابەر تکریتی ئێستا لەعێراق لەنێوان موسل و فورات) وەك فەرماندەیی ئەوان دیاری کرد. ئەو نێوان سواد و جزیرەی لەدەستدا بوو. ئەم فەرماندەیە روبەروی رۆمیەکان بوویەوە و پاشای ئەوانی کوشت و سوپاکەیانی کوشتار کرد. ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی رۆمیەکان شاری قوستەنتینە (کونستانتین) دروست بکەن. ئەو یەکەم کەس لەپاشاکانی رۆم بوو باوەری بەئایینی مەسیحی هێنا. ئەو پاشماوەکانی منداڵەکانی ئیسرائیلی لەفەلەستین و شام دەرکرد چوونکە گومانی وابوو یەهودییەکان عیسا کوڕی مریەمیان کوشتووە. بەگومانی ئەوان ئەو دارەی عیسایی پێ لەخاچ درا، یەهودییەکان هێنایانە شوێنی لەخاچ دانەکە. رۆمیەکان زۆر رێز لەو دارە دەگرن و بردیانە ناو گەنجخانەکانی خۆیان و ئێستایش لای ئەوانە.

پاشایەتی ئێران بەردەوام بەربلاو بوون تا ئەردەشیر کوڕی بابەك (ئەردەشیری بابەکان، فەرمانڕەوا لە ٢٢٦ تا ٢٤١ ز) بەپاشایەتی گەشت. هوشام رۆژگاری پاشایەتی ئەوی رون نەکردۆتەوە.

زانا ئاگادارەکانیتر لەمێژووی ئێران دەڵێن: دوای ئەسکەندەر پاشاکان لەئێران فەرمانڕەوایی ئەم سەرزەمینەیان کرد و ئەوان فەرمانبەری پاشاکانی کوێستان بوون. ئەوان پاشاکانی تیرەکان بوون وبەئەشکانییەکان ناودەبران و رۆژگاری پاشایەتیان دوسەد ساڵ و بەوتەی هەندێ کەس سێسەد و چل ساڵ بوو. لەناو ئەواندا ئەشك کوڕی ئەشکان بیست ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. دوای ئەو کورەکەی شاپور بۆ ماوەی شەست ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و لەچل و یەکەمین ساڵی پاشایەتی ئەو عیسا لەدایك بوو. تیتوس کوڕی ئەسفیانوس پاشای رۆمەکان، چل ساڵ دوای بەرزبوونەوەی عیسا مەسیح بۆ ئاسمان، هێرشی کردە سەر بیت المقدس و کوشتاری کرد و دیلی گرت و شاری کردە وێرانە. پاشاکانیتری ئەشکانی بریتی بوون لە: گودەرز کوڕی ئەشکانانی گەورە بیست ساڵ، بیرن ئەشکانی بیست ویەك ساڵ، گودەرز ئەشکانی، هەشتا و نۆ ساڵ، ئێرسی ئەشکانی چل ساڵ، هورمز ئەشکانی حەفدە ساڵ، ئەردوان ئەشکانی، بیست و دوو ساڵ، خوسرەو ئەشکانی چل ساڵ، بلاش ئەشکانی بیست و چوار ساڵ، ئەردوانی بچوك سیانزە ساڵ و ئەردەشیر کوڕی بابەك.

دەستەیەك دەڵێن: دوای ئەسکەندەر پاشاکانی تیرەکان کەئەو ولاتی ئێرانی لەناودا دابەش کردن، فەرمانڕەوایەتی ئێرانیان کرد. هەرکام لەوان بەجیا فەرمانڕەوایی ناوچەکانی ژێر دەستی خۆی دەکرد و ئەمە جگە لە بەشی سواد بوو کەدوای ئەسکەندەر بۆ پەنجا و چوار ساڵ لەدەست رۆمیەکاندا مایەوە. لەناو پاشای تیرەکان پیاوێك لەرەچەڵەکی پاشاکان بەسەر کوێستان و ئیسفەهاندا زاڵ بوو و دوای ئەو کورەکانی سوادیان داگیر کرد و لەسەر ئەم سەرزەمینە هاوشێوەی کانیاوەکان و کوێستان و ئیسفەهان فەرمانڕەوایەتیان کرد چوونکە وا بلاو ببوویەوە ئەو و مناڵەکانی بەگەورەی خۆیان بزانن. لەبەر ئەمەیە ناوی ئەوان لەمێژووی پاشاکاندا

هاتووە. ئێمەیش لەسەر ئەم بنەمایە، تەنیا بەئاماژەدان بەوان بەسەندەمان کرد و ئەوانیترمان پشت گوێ خست. رۆژگاری پاشایەتی تیرەکان دووسەد و شەست ساڵ و بەوتەی هەندێ کەس سێسەد و چل و چوار ساڵ و بەوتەی هەندێ کەس پێنسەد و بیست و سێ ساڵ بوو. و خوا زاناترە.

لەناو ئەو پاشایانەی فەرمانڕەوایەتی کوێستانیان دەکرد و دوای کورەکانیان زاڵ بوون بەسەر سواد، ئەشك کوڕی جزە بوو. بەوتەی هەندێ کەس، لەرەچەڵەکی ئیسفەندیار کوڕی گشتاسبە. دەستەیەك لەئێرانییەکان گومان دەکەن ئەشك کوری دارایە. دەستەیەك دەڵێن: ئەشك بەنەشکانی گەورە لەمناڵەکانی کەیکاوسە کەبیست ساڵ پاشایەتی کرد. دوای ئەو کەسەکان بەم شێوە فەرمانرەوایەتیان کرد: کورەکەی ئەشك بیست و یەك ساڵ، شاپور کوڕی ئەشك سی ساڵ، گودەرز کوڕی شاپور دە ساڵ، کورەکەی بیرن بیست و یەك ساڵ، کورەکەی گودەرزی بچوك بیست ویەك ساڵ، نێرسی کوڕی گودەرز چل ساڵ، هورموز کوڕی بلاش کوڕی نەشکان حەفدە ساڵ، ئەردوانی بچوك کوری بلاش( کە ئەو گەورەترین و بەتواناترین و رێزدارترین پاشاکانی ئەشکانی و زاڵترینی ئەوان بەسەر پاشاکان بوو) سیانزە ساڵ. دوای ئەو ئەردەشیر کوڕی بابەك هاتەسەر کار کەئێرانی یەك خستەوە و بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

دەستەیەکیتر، کەسانیتریان لەناو پاشاکان(جیاواز لەوانەی ئێمە ناومان بردن) دەگونجێنن کەپێویست بەدرێژدادری یا ئاماژەدان بەوان نییە. ئێمە هەندێك لەوەی وتراوە، لەکاتی وتوویژ لەپاشایەتی ئەردەشیر کوڕی بابەك باس دەکەین.

## ڕوداوەکانی ڕۆژگاری پاشاکانی تیرەکان و لەناو ئەوان عیسا کوڕی مریەم و یەحیا کوڕی زەکەریا

ئێمە لەبەر ئەوە ئەم دو ڕوداوە گەورەمان لەم باسەدا کۆکردۆتەوە چوونکە پەیوەستی یەکترن. دەڵێین: عیمران کوڕی ماسان لەمناڵەکانی سلێمان کوڕی داوود بوو و بنەماڵەی ماسان لەگەورەکان و کاهینەکانی مناڵەکانی ئیسرائیل بوون. ئەو حەنە کچی فاقوری (فاقوز)ی هاوسەر بوو و زەکەریا کوڕی بەرخیا خوشکەکەی ئیشاع. ئیشاع خوشکی مریەم کچی عیمران بوو. حەنە گەوری و پیر و ناتەوان ببوو بێ ئەوەی مناڵی هەبێت. جارێك کاتێك لەژێر سێبەری دارێکدا بوو، باڵندەیەکی بینی جوجکەکەی خۆی دان دەدات. لەبەر ئەم ئارەزووی مناڵی کرد و لەخوا پاڕایەوە مناڵێکی پێببەخشێت. ئەو پەیمانی لەگەڵ خوا بەست ئەگەر مناڵێکی پێببەخشێت دەیکاتە دەرگاوان و خزمەتکاری بیت المقدس. ئەو مناڵەکەی ناو سکی ئازاد کرد بەڵام نەیدەزانی کوڕە یا کچە. پەیمانی ئازاد بەستن لەگەڵ خوا لای ئەوان بەم شێوە بوو کەمناڵەکەیان بەکەنیسە دەبەخشی تا کاری تیا بکات و تا قۆناغی گەورەبوون لەوێ نەیێتەدەر. کاتێك گەورە دەبوو ئازادی بکەن ئەگەر دەیەوێت بمێنێتەوە و ئەگەر نایەوێت بۆ هەر شوێنێك دەخوازێت بڕوات. پەیمانی ئازاد تەنیا کوڕەکانی دەگرتەوە چوونکە ژنان – کە نەخۆشی و خوێنبەربوونی مانگانە دەبینن- شیاوی ئەم کارە نەبوون.

دواتر عیمران مرد ولەمکاتەدا حەنە بەمریەم دووگیان بوو. کاتێك ئەوی هێنایە دنیا، بینی کچە و لەم کاتەدا بەخوای وت: خوایە، کچێك بۆ من هاتە دنیا – و خوا لەوەی ئەو بووی ئاگادارتر بوو—و نێر وەك مێ نییە. چوونکە ئەو دەتوانێت خزمەتی کەنیسە بکات و ئەمەیان ناتوانێت و من ناوم نا مریەم ( ال عمران/٣/٣٦). مریەم لەزمانی ئەوان یانی پەرەستین. دواتر ئەو ژنە مناڵە کچەکەی لەپەرۆیێکەوە پێچا و ئەوی بردە مزگەوتی لەپێشترین (المسجد الاقصی) و لەبەرابەر کاهینەکان کە لەرەچەڵەکی هارون بوون، لەسەر زەوی داینا. ئەوان سەرپەرەستی ئەو کارەیان دەکرد کەمناڵەکانی شەیبە لەکەعبە دەیانکرد. ژن وتی: ئەم کچە پەیمان بەستووە بۆ خوا

وەربگرن. ئەوان لەسەر وەرگرتنی کەوتنە گفتوگۆ چوونکە ئەو کچی رێبەرو خواوەندی شوێنی قوربانی کردنی ئەوان بوو. زەکەریا وتی: من بەو شیاوترم چوونکە پوری ئەو لەماڵی مندایە. وتیان: بەڵام ئێمە بۆ ئەمکارە تیروپشك دەکەین. بۆ ئەم مەبەستە پێنوسەکانی خۆیان خستە رووبار – کە هەمان روباری ئەردەن بوو- .. ئەو پێنوسانەی تەوراتیان پێدەنوسی. پێنوسەکەی زەکەریا هاتەسەر ئاو و پێنوسی ئەوان رۆشتە ژێر ئاو. زەکەریا کچەکەی هەڵگرت و بو بەسەرپەرەستی و ئەوی بردە لای پوری دایکی یەحیا و ژنێکی شیردەری بۆ گرت تا گەورە بوو. ئەوکات هەورەبانێکی لەمزگەوتدا بۆ دروست کرد کە تەنیا بەپەیژە دەتوانی برۆیتە ئەوێ و کەس جگە لەو بۆی نەبوو بچێتە ئەوێ. ئەو میوەی زستانی لەهاویندا لای ئەو دەبینی و میوەی هاوینی لەزستاندا. پێی دەوت: ئەمانەت لەکوێوە هێناوە؟ دەیوت: لەلای خوا. کاتێك زەکەریا ئەمەی لەو بینی، لەخوا پاڕایەوە و خوازیاری مناڵ بوو چوونکە میوەی زستانی لەهاویندا دەبینی و هاوینی لەزستاندا. ئەو وتی: ئەوەی ئەمەی بەمریەم بەخشی، دەتوانێت ژنەکەی من چاکبکاتەوە تا مناڵی ببێت. ئەو وتی: خوایە کورێکی پاکم پێببەخشە کە تۆ بیسەرێکی ولأمدەرەوەیت (ال عیمران/٣/٢٨).

جارێك کە ئەو لەشوێنی قوربانی کردن بۆ نوێژ وەستابوو، پیاوێکی گەنجی بینی،(جبرەئیل). لێی ترسا. جبرەئیل پێی وت: خوا موژدەی یەحیات پێدەدات کەقسەکانی خوا بەراست دەزانێت (ال عیمران/٣/٣٩). دەڵێت: ئەم یەحیایە (عیسا کوڕی مریەم بەراست و راستگۆ دەزانێت چوونکە یەحیا یەکەم کەس بوو باوەڕی پێیکرد و بەراستگۆی زانی. داستانەکە بەمشێوەبوو: دایکی ئەوی لە سکدا بوو و مریەمی بینی بەعیسا سکپڕە وپێی وت: ئەی مریەم، ئایا تۆ سکت هەیە؟ مریەم وتی: لەبەرچی ئەمە دەپرسیت؟ دایکی یەحیا وتی: دەبینم ئەوی لەسکی مندایە نوێژ بۆ ئەوی سکی تۆ دەبات.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەسێ ساڵیدا، عیسای بەراستگۆ دانا و خوای گەورە ناوی نا یەحیا و پێش ئەوە کەسیان بەوناوە بانگ نەکردبوو. خوای گەورە دەفەرمێت: پێش

ئەو بۆ ئەو هاوناوێکمان دروست نەکرد (مریم/١٩/٧). دووبارە خوای گەورە دەفەرمێت: سلاو لەو، رۆژێك کە لەدایك دەبێت و رۆژێك کەدەمرێت و رۆژێك کەدووبارە زیندوو دەبێتەوە و هەڵدەستێتەوە (مریم/١٩/١٥). دەڵێن: ترسناکترین رۆژی مرۆڤەکان لەم سێ رۆژەدا دەبێت کەخوا یەحیایی لەترسی ئەم سێ رۆژە پاراست. یەحیا سێ ساڵ یا شەش مانگ پێش مەسیح لەدایك بوو. ئەو تێکەڵاو بەژنان نەدەبوو و لەگەمە کردن لەگەڵ منالآن رایدەکرد.

زەکەریا وتی: خوایە، من لەکوێ منالم دەبێت. من پیربووم و ژنەکەم نەزۆکە (ال عیمران/٣/٤٠). لەمکاتەدا نەوەد و دوو یا سەد و بیست ساڵ لە ژیانی تێپەریبوو و ژنەکەی نەوەد و هەشت ساڵ: پێی وترا: بەمشێوەیە، خوا هەرچی بوویت دەیکات (ال عیمران/٣/٤٠). زەکەریا ئەم وتەی بۆ بەدەست هێنانی ئاگاداری کرد کەئایا لەم ژنە نەزۆکەی منالی دەبێت یا لەیەکیتر. ئەمەی بۆ ئەوە نەوت لەتوانایی خوا گومانی بێت. زەکەریا وتی: خوایە، نیشانەیەکم پێببەخشە. خوا وتی: نیشانەکەی تۆ ئەوەیە کەسێ رۆژ جگە لە(نمون) ئیشارە لەگەڵ خەلکدا قسە ناکەیت (ال عیمران/٣/٤١). دەڵێت: خوا لەسزای ئەوەی داوای نیشانەی کرد، زمانی لێسەندەوە. نمون بەمانای نیشاندان و ئیشارەیە.

کاتێك چاوی بەدنیا هەڵهێنا، باوکی بەجوان روخسار، کەم مو، پەنجەی کورت، برۆی پەیوەست، دەنگی نەرم، بەهێز لەفەرمانبرداری خواوەند و پارێزەکار لەسەردەمی منالیەوە بینی. خوای گەورە فەرمووی: لەمنالی پەیغاممان پێبەخشی (مریم/١٩/١٢). دەڵێن رۆژێك منالەکانی هاوتەمەنی پێیان وت: ئەی یەحیا، با پێکەوە یاری بکەین. وتی: بۆ یاری کردن نەئافرێنراوم. ئەو گیا و گەڵای داری دەخوارد. دەستەیەك دەڵێن: رۆژێك ئیبلیس لای تێپەری و ئەو نانی جۆی دەخوارد و پێی وت: ئایا گومان دەکەیت پارێزکاریت؟ ئەی بۆ نانی جۆت کەلەکە کردووە؟ یەحیا وتی: نفرینی خوات لێبێت، ئەمە بۆ خواردنە. ئیبلیس وتی: کەمترین خواردن بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ نەمرێت. خوا وەحی بەیەحیا کرد و وتی: لەوەی ئیبلیس پێت دەڵێت، تێبگە.

ئەو لەمناڵی بوو بەپێغەمبەر و لەبەر ئەمە، لەوکاتەوە خەڵکی بۆ خواپەرستی هاندەدا. ئەو جلی دروست کراو لەموی لەبەر دەکرد. ئەو درەم و دینارێکی و ماڵی نەبوو رووی تێ بکات. هەر کوێ شەو دادەهات، ماڵی ئەو بوو. ئەکۆیلەی بوو نەکەنیز. بۆ پەرەستینی خوا بەسەختی هەوڵی دەدا. رۆژێك سەیری جەستەی خۆی کرد وبە لاغری بینی و گریا. خوا وەحی پێکرد: ئەی یەحیا، ئایا بۆ لاغری جەستەت دەگریت. سوێند بە بەهێزی و گەورەییم ئەگەر لەئاگری دۆزەخ ئاگادار بیتەوە، لەجیاتی ئەو جل و بەرگەی ئێستات جل و بەگری ئاسنین لەبەر دەکەیت! ئەو دووبارە گریا تا فرمێسك گۆشتی روخساریان خوارد و ددانی بۆ بینەران دەرکەوت. ئەم هەواڵە بەدایکی گەشت. دایك هاتە لای و زەکەریا لەگەڵ کاهینەکان هات و وتی: کورم، چ هۆکارێك بۆ ئەم کارە دەتبزوێنێت؟ یەحیا وتی: لەنێوام بەهەشت و دۆزەخ بەرزاییەکی نارێکە کە جگە لەو کەسانەی دەگرین کەس ناتوانێت لێی تێپەر بکات. زەکەریا وتی: کەواتە بگری و هەوڵ بدە. دایکی دوو تیکە نەمەدی بۆ دوری کە لەروخساری دەبەست و ددانەکانی پێ دادەشارد. ئەوەندە دەگریا ئەو دوو تیکە نەمەدە تەڕ دەبوون. کاتێ زەکەریا دەیویست ئامۆژگاری خەڵك بکات، دەیروانی ئەگەر یەحیا ئامادە بووایە، باسی بەهەشت و دۆزەخی نەدەکرد.

خوا عیسای بۆ پێغەمبەری هەڵبژارد و هەندێك لەفەرمانەکانی تەوەراتی پاك کردەوە و نەیهێشت. یەکێك لەو فەرمانانە ئەوە بوو بەهاوسەر گرتنی کچی برای کردە ناڕەوا. پاشاکانی ئەوان- بەناوی هیرۆدۆس- کچی برایەکی بوو کە زۆری خۆش دەویست و دەیوست بیکاتە هاوسەری خۆی. یەحیا رێگەی ئەم کارەی لێدەگرت. کچەکە هەر رۆژە نیازێکی دەبردە لای پاشا کەبەراوەردەی دەکرد. کاتێك ئەم هەواڵە بەدایکی کچە گەشت، بەکچەکەی خۆی وت ئەگەر پاشا لێی پرسی چیت دەوێت، بڵێ یەحیا کوڕی زەکەریا سەر ببرە. کاتێك کچەکە هاتە لای پاشا، لێی پرسی: چیت دەوێت؟ کچەکە وتی: دەمەوێت یەحیا کوڕی زەکەریا سەرببڕیت. پاشا وتی: جگە لەمە داوای شتێتر بکە. کچ وتی: جگە لەمە هیچم ناوێت. کاتێك کچەکە پێداگری کرد، پاشا یەحیای بانگ کرد و تەشتێکی داوا کرد و سەری بڕی. کاتێك کچ سەری

براوی یەحیای بینی وتی: ئێستا چاوم رون بوویەوە. لەمکاتەدا کچەکە رۆشتە سەر بانی کۆشکەکە بەلاَم کەوتەخوار. پاشا چەندین سەگی درِندەی لەخوارەوەی کۆشکەکەی رِادەگرت. سەگەکان هێرشیان کردەسەر، خواردیان و پاشا سەیری دەکرد. دوایین ئەندام کەخواردیان، چاوەکانی بوو تا وانە وەربگرێت. کاتێك یەحیا کوژرا دلۆپێك خوێنی پرژایە سەر زەوی. ئەم دلۆپە خوێنە هەلّدەقولاَ تائەو کاتەی خوا بخت النسری بۆناردن و ژنێك هاتە لای و ئەوی بۆ سەر ئەو دلۆپە خوێنە رێنوینی کرد. خوا وای خستە دلّی بخت النسر تا ئەوەندەیان لێبکوژێت تا ئەو دلۆپە خوێنە دامرکێت. ئەو حەفتا هەزار کەسی لەوان کوشت تا ئەو دلۆپە خوێنە دامرکایەوە.

سەدی شوعیا بابەتێکی هاوشێوەی ئەمەی ئاماژە پێداوە جگە لەوەی وتویەتی: پاشا ویستی کچی ژنەکەی خۆی بکاتە هاوسەری خۆی. یەحیا رێگەی ئەم کارەی لێگرت. ژن داوای لەپاشا کرد یەحیا بکوژێت. پاشا کەسی نارد تایەحیا بکوژێت و سەریان لەناو تەشتێکدا هێنا و ئەو سەربراوە بەردەوام دەیوت: ئەم کچە بۆ تۆ رِەوا نییە. خوێنەکەی قوِلّپی دەدا. خۆلّیان دەکردە سەر و خوێن هەلّدەقولاَ تا ئەوەی گەشتە سەردیواری شار و ئارامی نەگرت. خوا بخت النسری هەلّبژارد تا بەسوپایەکی فراوانەوە بێت. بخت النسر ئەوانی گەمارۆ دا بەلاَم نەیتوانی بەسەریاندا سەرکەوێت. ویستی بگەرێتەوە بەلاَم ژنێك لەمنالّەکانی ئیسرائیل هاتە لای و پێی وت: بیستومە دەتەوێت بگەرێیتەوە. وتی: بەلّێ، مانەوەم زۆری خایاند و خەلّك برسیەتیان کێشا و خواردەمەنی و ئازووغە روو لەکەمییە و زەوی بۆ ئەوان تەنگ و تاربووە. ژن وتی: ئەگەر بۆ شار رێنوێیت بکەم و بۆتی بکەمەوە، ئەوانەی دەیلّێم دەیکوژی و کاتێك وتم دەست هەلّدەگری؟ بخت النسر وتی: بەلّێ. ژن وتی: سوپاکەت بۆ چوار دەستە دابەش بکە و لەچوار سوچی شاردا بلاَویان بکەرەوە. دواتر هەمووتان دەست بۆ ئاسمان بەرز بکەنەوە و بلّێن خوایە ئێمە گرتنی ئەم شارەمان لەتۆ دەوێت و تۆ بەخوێنی یەحیا سوێند دەدەین. ئەم کارەیان کرد و دیواری شار دارِما و سوپاکەی رۆشتنە ناوشار. پیرێژن فەرمانیدا ئەوەندە خوێن بەسەر خوێنی یەحیادا برێژن تا خوێنی یەحیا ئارام بگرێت. ئەو دەیکوشت تا ئەوەی حەفتا هەزار کەسی سەربرِی و خوێن ئارامی گرت و پیرێژن فەرمانیدا دەست لەکوشتن هەلّبگرن و بخت النسر

دەستی لەکوشتار هەلگرت.

ئەو بیت المقدسی وێران کرد و لاشەی کوژراوەکانی لەناو شارەکەدا فرێدا. دواتر گەرایەوە و لەگەڵ ئەو دانیالی پێغەمبەرو سەرانی منالەکانی ئیسرائیل، لەناو ئەوانیش، عەزریا، میشاییل و ئەوانیتر گەڕانەوە و سەری جالوتیان پێبوو. دانیال ڕێزداترین کەس لای بخت النسر بوو و لەبەر ئەمە ئاگرپەرستەکان رژدیان پێدەبرد و لای بخت النسر خراپەی ئەویان هێنایە سەرزمان، بێژەر وتەکەی بەوشێوەی ئاماژەی پێدرا، درێژە پێدەدات: هاویشتنی ئەوان بۆ ناو دڕندەکان و هاتنە خوارەوەی پاشا (یا فریشتە) و گۆرینی رۆخساری بخت النسر بۆ روخساری ئاژەڵ و مانەوەی ئەو لەناو دڕندەکان بۆ حەوت ساڵی دژوار.

ئەم وتارە و وتارەکانیتر لەبارەی بخت النسر (وەك دەڵێن وێرانکەری بیت المقدس بخت النسر بوو و ئەو بوو دوای کوشتنی یەحیا کوشتاری منالەکانی ئیسرائیلی کرد) لای زانەرانی بەسەرهاتەکان و مێژوەکان و ئاگاداران لەکارەکانی رابردوو، هەڵیت و پلیتە چوونکە ئەوان لەسەر ئەو باوەڕە کۆکن کەبخت النسر دوای کوژرانی شوعیای پێغەمبەر لەسەر دەستی منالەکانی ئیسرائیل لەرۆژگاری ئەرمیا کوڕی حزقیا، شەڕی لەگەڵ منالەکانی ئیسرائیل کرد و لەنێوان رۆژگاری ئەرمیا تا کوژرانی یەحیا ٤٦١ ساڵە و ئەم بابەتە لەلای یەهودی و مەسیحییەکان پشت راستی دەکرێتەوە و دەڵێن بەمشێوەیە. لەئەسفار و کتێبەکانی ئەوان بەڕوونی نوسراوە. هاوڕا بوونیان لەگەڵ ئاگرپەرستەکان سەبارەت بەدرێژی رۆژگاری شەڕ و شوری بخت النسر لەگەڵ ئیسرائیلیەکان تامردنی ئەسکەندەر و تا لەدایك بوونی یەحیایە. ئەوان گومان دەکەن درێژییەکەی پەنجا و یەك ساڵ بووە.

بەلأم کوڕی ئیسحاق دەڵێت: راستییەکەی ئەوەیە منالەکانی ئیسرائیل دوای گەڕانەوە لەبابل، بین المقدسیان دووبارە ئاوەدان کردەوە و ژمارەیان روی لەزیاد بوون کرد و ئەوسا ئەوان پشتیان کردە خوا و گەڕانەوە سەر گوناحکاری خۆیان و خوا گەرایەوە بۆلایان و پێغەمبەرەکانی بۆ رەوانە کردن کەدەستەیەکیان بەدرۆزن زانی و دەستەیەکیان کوشت تا ئەوەی خوای گەرە دوایین پێغەمبەرەکانی بۆ ڕەوانە کردن: لەوانە: زەکەریا، کورەکەی یەحیا و عیسا کوڕی مریەم. منالەکانی ئیسرائیل یەحیا و

زەکەریایان کوشت و خوا یەکێك لەپاشاکانی بابلی کردە سەریان کەپێیان دەوت گودەرس(حردوش،حردوس،حاورس، خردوس، جردوس). سوپایەکی کردە سەریان و لەشام رووبەروویان بوویەوە. کاتێك لەبیت المقدس هێرشی کردە سەریان، بەیەکێك لەفەرماندە بەناو بانگەکانی خۆی بەناوی نەبووزانی وت: سوێندم خواردووە ئەگەر بەسەر منالەکانی ئیسرائیل دا زاڵ ببم ئەوەندەیان لێبکوژم تا جۆگەلەی خوێنی ئەوان بێتە ناو سوپاییەکانم و ئیتر کەس بۆ کوشتن نەدۆزمەوە. ئەو فەرمانی بەو فەرماندەدا برواتە ناو شار و ئەوەندەیان لێبکوژێت تا بەوشێوەی وترا خوێنی منالەکانی ئیسرائیل بێتە ناو سوپاییەکانی. نەبووزان هاتە ناوشار و رۆشتە ناو شارێك و لەوێ مایەوە کەقوربانییەکانی خۆیان دەهێنایە ئەوێ. لەوێ خوێنێکی بینی هەڵدەقوڵێت و پرسی: ئەی منالەکانی ئیسرائیل، داستانی ئەم خوێنە چییە. وتیان خوێنی یەکێك لەقوربانییەکانی ئێمەیە کەوەرنەگیراوە و لەبەر ئەمە بەردەوام هەڵدەقوڵێت. فەرماندە وتی راستیتان بەمن نەوت. منالەکانی ئیسرائیل وتیان: پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی لەناومان هەلگیراوە ولەبەر ئەمە ئەم قوربانییە وەرنەگیراوە و ئەو خوێنە بەردەوام هەڵدەقوڵێت. نەبوزان ٧٧٠ کەس لەگەورەکانی ئەوانی لەسەر ئەو خوێنە سەربڕی و ئارامی نەگرت. فەرمانیدا ٧٠٠ کەس لەزاناکانیان لەسەر ئەو خوێنە کوشت بەڵام ئارامی نەگرت. کاتێك بینی ئەو خوێنە سارد نابێتەوە وتی: ئەی منالەکانی ئیسرائیل راستیم پێبڵێن و لەسەر فەرمانی خواوەندی خۆتان خۆراگر بن چوونکە رۆژگارێکی درێژە لەسەر زەوی فەرمانڕەوان و هەرچیتان بووێت، دەیکەن. ئەگەر راستی بەمن نەڵێن ئەوەندەتان لێدەکوژم کە لەژن و پیاو یەك زیندوو نەهێڵمەوە.

کاتێك کۆشش و کوشتاری بێ ئەمانی ئەویان بینی، راستیەکیان پێوت. وتیان: ئەمە، خوێنی یەکێك لەپێغەمبەرەکانی ئێمەیە. ئێمەی لەزۆر لەو کارانەی دەبوون هۆی تووڕەی خوا، دەگەڕاندەوە و هاتنی ئێوەی پێشبینی کرد و بەئێمەی وت. نەبووزان پرسی: ناوی چی بوو؟ وتیان: یەحیا کوڕی زەکەریا. وتی: ئێستا راستیتان وت، لەبەر ئەمەیە خواوەندەکەتان رقی لێهەڵگرتون. ئەو کەوتە سەر زەوی و نوێژی بۆ خوا برد و بەهاورێکانی خۆی وت: دەرگاکان ببەستن و سوپاییەکانی گودەرس بنێرنەدەر. ئەم

کارەیان کرد و ئەو لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل بەتەنیا مایەوە و دواتر بەخوێنەکەی وت: ئەی یەحیا، خوای من و تۆ دەزانێت لەبەر تۆ چی بەسەر خەڵکەکەتدا هات و چەندە لەوان کوژران. بەڵێ پێش ئەوەی هەموو خەڵکەکەی تۆ بەشمشێر بکوژرێن، بەفەرمانی خوا ئارام بگرە. لەم کاتەدا خوێن ئارامی گرت و نەبووزان دەستی لەکوشتن هەڵگرت و وتی: باوەڕم بەخوای منداڵەکانی ئیسرائیل هێنا و بەراستی دەزانم و بێ گومان دەزانم جگە لەو خوایەك نییە. دواتر بەئیسرائیلیەکانی وت: گودەرس فەرمانی بەمن داوە ئەوەندەتان لێبکوژم تا جۆگەلەی خوێنتان بڕواتە ناو سوپاکەی و من توانایی نافەرمانی ئەوم نییە. وتیان: ئەم کارە بکە. فەرمانیدا و چاڵێکیان هەڵکەند و هەرچی وشتر و ئەسپ و مەڕوماڵات بوو، هێنایان و سەریان بڕی. ئەمەیان کرد و ئەوەندەیان سەربڕی تاخوێنێکی زۆر کۆبوویەوە. دواتر ئاوی تێکرد و خوێن گەشتە ناو سوپای گودەرس. دواتر نەبووزان فەرمانیدا ئەو کوژراوانە بێنن و خستیانە سەر چوارپێکان و کاتێك گودەرس لەخوێنەکەی ڕوانی، کەسێکی بۆ لای نەبووزان نارد و وتی: لەکوشتن دەست هەڵگرە چوونکە ڕقم و کینەی خۆم لەوان سەندەوە.

ئەمە دووەمین سزایەکە خوا بەسەر منداڵەکانی ئیسرائیلدا باراندی. خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی محمد دەفەرمێت: بەمنداڵەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل لەپەیام و نامەکەی خۆمان پەیامان دا و ئامۆژگاریمان کردن کەبەناچاری دووجار لەسەر زەوی نافەرمانی و ستەمکاری دەکەن، یاخێبوونێکی سەرەڕۆیانە. کاتێك سەرەی یەکەمجار هات، بەندە سەرسەخت و سەختگیرەکانی خۆمانتان بۆ دەنێرین کەماڵ بەماڵ بەدواتانا دەگەڕێن و ئەمە مژدەیەکە دێتەدی. ئەوسا سوڕانی کاروبارەکان لەزیانی ئەوان و بەرژەوەندی ئێوە دەسوڕێنین و ئێوە بەمنداڵەکان و سامانەکان هاوکاری دەکەین و لەوەی بوون، زیاترتان دەکەین. ئەگەر چاکە بکەن، بەخۆتانی دەکەن و ئەگەر خراپە بکەن بەخۆتان. کاتێك کاتی سزادانی دووەم هات، لەروخساری ئێوە خەم دەردەکەوێت و دەڕۆنە مزگەوتی گەورە وەك چۆن جاری یەکەم ڕۆشتن وتا لەناو بەرن ئەوەی دەتوانن و بەدەستی بێنن و سەرکەوتن بەدەست بێنن. خوای ئێوە ئەوەندەی دەیەوێت پێتانی دەبەخشێت و ئەگەر بگەڕێنەوە، دەگەڕێینەوە. و

دۆزەخمان کردە شوێنی ئاسپاسان و جێگەی ئەوان (منالەکانی ئیسرائیل (٤/١٧).

روداوی یەکەم. ناردنی سوپای بخت النسر و لەشکرەکەی بوو. دواتر خوا بارودۆخی لەبەرژەوەندی ئەوان سوراند. ئەوسا روداوی دووەم هات کەهاتنی گودەرس و هاورێکانی بوو و ئەمە گەورەترین روداو هەژمار دەکرا کەتیایدا کوژرانی پیاوەکان، دیل بوونی ژنانیانی لێکەوتەوە. خوا دەفەرمێت: تا ئەو شوێنەی دەتوانن یاخی دەبن (منالەکانی ئیسرائیل /٤/١٧).

دەستەیەك لەزاناکان دەڵێن روداوی کوژرانی یەحیا لەرۆژگاری ئەردەشیر کوڕی بابەك بووە. هەروەها وتراوە روداوی کوژرانی ئەو یەك ساڵ و نیو دوای رۆشتنی عیسا بۆ ئاسمان بووە.

## داستانی کوژرانی زەکەریا

کاتێك یەحیا کوژرا و باوکی لەم کارە ئاگادار بوویەوە، رایکرد و لەنزیك بیت المقدس لای بێستانێك پەنای گرت. پاشا ناردی بەدوایدا. و زەکەریا لای دارێك تێپەری کەبانگی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا وەرە لای من. کاتێك نزیکی بوویەوە، دارەکە قەڵشا و رۆشتە ناوی و دارەکەی وەك خۆی لێهاتەوە وئەو لەناویدا مایەوە. دوژمنی خوا ئیبلیس هات و داوێنی کراسەکەی گرت و لەدارەکەی کێشایەدەر تا کاتێك بۆیان دەگێرێتەوە، ئەو بەراستگۆ بزانن. ئەوسا رۆی بەدوای ئەو کەسانەی شوێن زەکەریا کەوتبوون و ئەوانی ئاگادار کردەوە و وتی: چیتان دەوێت؟ وتیان: بەدوای زەکەریادا دەگرێین. ئیبلیس وتی: ئەو ئەم دارەی جادوو کرد و رۆشتە ناوی. ئەوان وتیان: تۆ بەراستگۆ نازانین. ئیبلیس وتی: من نیشانەیەکم هەیە کەباوەڕ بەقسەکانی من دەکەن. داوێنی کراسەکەی زەکەریایی نیشاندا. ئەوان تەوریان هەڵگرت و دارەکەیان کردە دوو لەت و بە مشارە بڕیانەوە و زەکەری لەناویدا مرد. خوا پیسترین خەڵکانی سەرزەوی بەسەردا زاڵ کردن تا رقیان لێهەڵگرێت.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری کوژرانی ئەو، ئەوە بوو: ئیبلیس رۆشتە ناو کۆڕەکانی مناڵەکانی ئیسرائیل و داوێنی مریەمی بە درۆ پیس و بە گوناحی زەکەریای لەقەڵەمدا و وتی: جگە لەزەکەریا کەس ئەوی سکپڕ نەکردووە و ئەوە دەچێتە لای مریەم. مناڵەکانی ئیسرائیل شوێن زەکەریا کەوتن و ئەو رۆشتە ناو دار و تا کۆتایی درێژەی پێدەدرێت.

## داستانی لەدایك بوونی عیسا و پێغەمبەری ئەو تا کۆتایی کار

لەدایك بوونی عیسا لەسەردەمی پاشای تیرەکان بوو. ئاگرپەرستەکان دەڵێن: لەدایك بوونی عیسا پەنجا و پێنج ساڵ دوای زاڵبوونی ئەسکەندەر بەسەر بابل و پەنجا ویەك ساڵ دوای دامەزراندنی بنەماڵەی ئەشکانی بوو. مەسیحیەکان دەڵێن: لەدایك بوونی ئەو سێسەد و شەست و سێ ساڵ دوای زاڵبوونی ئەسکەندەر بەسەر بابلدا بوو. ئەوان گومان دەکەن یەحیا شەش مانگ پێش عیسا لەدایك بوو و مریەم لەسیانزە، پانزە یا بیست ساڵیدا بە عیسا دووگیان و عیسا تا بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان سی و دوساڵ و چەند رۆژێك ژیا و مریەم دوای ئەو شەش ساڵ مایەوە. لەبەر ئەمە هەموو تەمەنی مریەم پەنجا و یەك ساڵ بوو.

یەحیا پێش بەرز بوونەوەی عیسا کوژرا و پێغەمبەری لەسی ساڵی عیسادا بۆ ئەوهاتە خوار.

ئێمە بەسەرهاتی ژیانی مریەم مان لەزەمانی کارکردن لەکەنیسە گێرایەوە. ئەو و کورە مامەکەی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ماسانی دارتاش بۆ کەنیسە کاریان دەکرد و لەوێ دەژیان. یوسف کوڕی یەعقوب فرەزانێکی دارتاش بوو کە بەدەستی خۆی کاری دەکرد و داهاتەکەی لەرێگای خوادا دابەش دەکرد. مەسیحیەکان دەڵێن: یوسف مریەمی بەهاوسەری هەڵبژاردبوو بەڵام تا ئەو کاتەی عیسا بۆ ئاسمان بەرز بوویەو ئەو نزیکی لەگەڵدا نەکرد. و خوا زاناترە.

کاتێك مریەم و کورەکەی مامی ئاویان کۆتایی پێدەهات، هەرکام گۆزەی خۆیان هەڵدەگرت و دەرۆشتنە ئەشکەوتێك، کە ئاوی تیابوو و ئاوی پاکیان هەڵدەگرت و دواتر هەردووك بۆ کەنیسە دەگەڕانەوە. کاتێك ئەو رۆژە هات کەجبرەئیل چاوی پێیکەوت، ئاوەکەی کۆتایی هاتبوو. ئەو بەیوسفی وت: با پێکەوە برۆین بۆ کانی. یوسف وتی: بەئەندازەی تا بەیانی ئاوم هەیە. مریەم بەتەنیا رۆشت و لەوێ جبرەئیلی بینی کەهاتۆتە لای (ئێمە سەرەتا داستانی مناڵبوونی ئەو بەشێوەیەکی چڕ کەلە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، دەگێرینەوە چوونکە داستانەکانیتر هەموویان لەدەوری ئەم ئایە چنراون و لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە. دەفەرمێت: بیری مریەم

بکەرەوە کاتێك لەکەسەکانی خۆی دوور دەکەوێتەوە و روی کردە شوێنێك کە هەتاو لەوێوە سەر دەردێنێت. ئەو لای خۆی لەکەسەکانی خۆی شەرمی دەکرد و ئێمە نێردراوی خۆمان بۆ لای نارد کە ئەو وەك لاوێکی جوان روخسار بوو. مریەم وتی: ئەگەر پیاوێکی لەخوا ترس بێت، لەتۆ پەنا بەخوا دەبەم و ئەمانم دەوێت. جبرەئیل وتی: من نێردراوی خوای تۆم تا بەتۆ کورێکی پاك ببەخشم. مریەم وتی: من چۆن کورم دەبێت؟ هیچ کام لەپیاوەکان نەهاتۆتە لای من و ژنێکی خراپەکار نەبووم. نێردراوی ئێمە وتی: خوای تۆ فەرموویەتی ئەم کارە بۆ من ئاسانە. و ئێمە دەمانەوێت عیسا بۆ خەڵك بکەینە نیشانەیەك و ئەمە کارێکە دەکرێت و ئەنجام دەدرێت. مریەم بەعیسا دووگیان بوو و ئەوی لەسکی خۆیدا هەڵگرت و رۆشتە شوێنێکی دوور. ژانی زان، ئەوی بۆ لای دارێکی خورما برد. پاڵی پێوەدا و لەدڵتەنگی و شەرمدا وتی: خۆزگە پێش ئەمە دەمردم و لەبیر دەچومەوە. عیسا لەژێرەوە پێی وت: خەم مەخۆ و خەمبار مەبە. خوای تۆ لەژێر تۆ جۆگەلەیەکی رەوان کردووە. تۆ داری خورما بجوڵێنەرەوە تا خورمای تازەت بۆ بخاتە خوار. بخۆ و بخۆرەوە و چاو بەکورەکەت رون بێت و ئەگەر چاوت بەکەسێك کەوت، بڵێ: ئەمرۆ بەرۆژوم و لەبەر ئەمە لەگەڵ کەس ناتوانم قسە بکەم. مریەم عیسای هێنایە لای خەڵکەکەی و ئەوان وتیان: ئەی مریەم کارێکی ناشیرین و نەشیاوت کردووە. ئەی خوشکی هارون، ئەباوکت پیاوێکی خراپ بوو ئەدایکت روسپی. مریەم عیسای نیشاندا و ئەوان وتیان: چۆن لەگەڵ منالێکدا قسە بکەین کەهێشتا لەناو لانکەدایە؟ عیسا وتی: منم بەندەی خوا. نوسراوی دا بەمن و منی کردە پێغەمبەری خۆی و من لەهەر کوێبم بەختەوەرم دەکات و تا ئەو کاتەی زیندوو بم، بەنوێژ و بەخشینی سامانی خۆم لەرێگای خوا فەرمانی پێداوم و چاکەی لەگەڵ دایك کرد و نەبەخشراوێکی بەدبەخت نەکرد. سڵاو لەمن لەو رۆژەی لێی لەدایك بووم، لەو رۆژەی دەمرم و لەو رۆژەی جارێکیتر زیندوو دەبمەوە و هەڵدەستمەوە (مریەم/١/١٩—٣٣).

کاتێك نێردراوی خوا ئەمەی وت: مریەم خۆی بەفەرمانی خوا سپارد و ئەو نێردراوە فوی کردە قۆڵی کراسەکەی و لێی دوورکەوتەوە و مریەم بە عیسا دووگیان بوو. ئەو گۆزەکەی خۆ پڕ کرد و گەڕایەوە. لەرۆژگاری ئەو کەسیان لەو و کورە مامەکەی

یوسفی دارتاش بە پاك تر و خواپەرستتر نەدەناسی. یوسف لەگەڵ ئەو بوو. یەکەم کەس بوو لەسکپڕبوونی توڕە بوو. کاتێك یوسف ئەوەی بینی، بە دژواری زانی و نەیزانی ئەمە کارە لەسەر چ بنەمایەك بەهێزە. ئەگەر بیەوێت ئەو بەداوێن پیس بزانێت، لەخواترسی ئەوی بیردەکەوێتەوە کەبۆ یەك ساتیش لێی دوور نەکەوتۆتەوە. ئەگەر بیەوێت بەپاکی بزانێت، ئەو سکە بەرزبووە دەبینێت و نازانێت چی بکات. کاتێك بابەتەکەی بۆ ئاڵۆز بوو، لەگەڵ مریەمدا کەوتە قسە و یەکەم قسەکە کردی ئەوە بوو: لەتۆ شتێکم نەبینی بمەوێت دایشارم و بیمرێنم بەڵام ئەمە لەدەست من دەرچوو. مریەم وتی: قسەیەکی جوان بکە. یوسف وتی: ئایا هیچ روەکێك بێ تۆو دەتوانێت برووێت؟ مریەم وتی: بەڵێ. یوسف وتی: ئایا منالٚ بێ پیاو (کەلەگەڵ ژندا جوت ببێت)، دەتوانێت ببێت؟ مریەم وتی: بەڵێ. ئایا نەتزانی کاتێك خوا لەرۆژی ئافراندن، ڕوەك و گیای ئافڕاند، لەتۆو کەڵکی وەرنەگرت؟ ئایا نەتزانی خوا داری بێ هاوکاری ویستن لەباران ئافڕاند؟ ئەو بەهێزی خۆی بارانی کردە هاوکاری دار و ئەمە دوای ئەوە بوو کەهەرکامی بەجیا ئافڕاند. ئایا دەتەوێت بڵێیت خوا ناتەوانێت بئافرێنێت تا لە تۆو و باران هاوکاری وەرنەگرێت؟ یوسف وتی: ئەمە ناڵێم بەڵام دەڵێم خوا بۆ هەموو کارێك بەتوانایە. ئەو بەهەر شتێك دەڵێت ((ببە)) و ئەو دەردەکەوێت. مریەم پێی وت: ئایا نازانی خوا ئادەم و حەوای بێ نێر و مێ دروست کرد؟ یوسف وتی: بەڵێ. کاتێك مریەم ئەمەی وت، یوسف ئەم ئەندێشەی کەوتە دڵەوە، ئەوەی مریەم هەیەتی لەخواوەیە و شیاو نییە بۆ ئەو پرسیاری لێبکات چوونکە دەبینێت مریەم دەیەوێت دایشارێت.

دەستەیەك دەڵێن: مریەم رۆشتە قەراغی ماڵێك چوونکە خوێنبەربوونی مانگانەی بوو. لەبەرابەر کەسەکانی خۆی پەردەیەکی لەدیوارەکان کێشا و کاتێك پاك بوویەوە ئەو پیاوەی بینی. درێژەی داستان بەوشێوەیە لەئایەکە ئاماژەی پێدرا. کاتێك دووگیان بوو، شەوێك پوری ژنەکەی زەکەریا هاتەسەردانی و کاتێك درگای بۆ کردەوە، پێوەی لکا. ژنی زەکەریا وتی: من سکپڕم. مریەم وتی: منیش. ژنی زەکەریا وتی: من بینیم منالەکەی من بۆ منالەکەی تۆ نوێژ دەبات.

ژنی زەکەریا یەحیای بوو. لەبارەی زەمانی سکپڕی مریەم جیاوازییەکان زۆرن. دەستەیەك دەڵێن: نۆ مانگ و ئەمە وتەی مەسیحیەکانە. دەستەیەك دەڵێن هەشت مانگ و ئەمە خۆی نیشانەیەکیترە چوونکە پێش ئەو هیچ منداڵێك بەهەشت مانگە لەدایك نەبوو. دەستەیەك دەڵێن: شەش مانگ و دەستەیەك سێ کاتژمێر و دەستەیەك یەك کاتژمێریان وتووە وئەمە لەقورئاندا ئاشکراترە کەخوا دەفەرمێت: بەو دووگیان بوو و دواتر ئەوی بردە شوێنێکی دوور. ئەوەی دەڵێت دواتر(وەرگێرانی ((فای عەرەبیە)) نیشانەی ئەومیە بێدرنگ سکی پڕبووە.

کاتێك مریەم ژان گرتی، رویکردە نوێژگەی رۆژهەلآت و رۆشتە قولآیی. ژانی زان ئەوی بۆ لای دار خورماکە برد و ئەوە وتی: - و ئەو لە ژان لەخۆی دەنالآ و لەخەڵك شەرمی دەکرد-: خۆزگە پێش لەمە مردبووم و بەتەواوی لەبیرکرابووم. یانی بیر و نیشانی من لەبیردەکرا و لەمن هیچ ناو و نیشانێك بەجێ نەدەما. مریەم وتی: کاتێك بەتەنیا بووم، عیسا قسەی لەگەڵ دەکردم و کاتێك کەسێکم لابوایە، وەسف کردنی ئەوم لەناو سکی خۆمەوە دەبیست. بانگی کرد جبرەئیل لەخوارەوە- یانی لەخوار کوێستان- خەمبار مەبە، خوا لەخوار تۆدا روبارێك عەقلی ڕەوانە کردووە. کەسێ کەلەم داستانەدا ئایەی (من تحتها) بەژێری میم خوێندبێت، دەڵێت ئەوەی ئەم قسەی بەمریەم وت عیسا بوو کەخوا زمانی پێبەخشی. ئەو وتی: لقی دارخورماکە بۆ لای خۆت رابکێشە. لقێکی بڕاوە بوو و لەناکاو بوو بەدارێك. دەستەیەك دەڵێن: لقێکی بڕاوە بوو کاتێك ژانی منالبوون ئارامی لێڕیبوو، لەنامێزی گرت و لقەکە سەوز و راست بوویەوە. بەمریەم وترا: لقی دارەکە بۆلای خۆت راوەشێنە. رایوەشاند و دارەکە خورمای تازەی بەرهەم هێنا. عیسا بەدایکی وت: بخۆ و بخۆرەوە و چاوت رونکەرەوە و ئەگەر کەسێك لەخەڵکانت بینی بڵێ: بۆ بێدەنگی بەرۆژوم و ئەمرۆ ناتوانم لەگەڵ کەس قسە بکەم. کەسێ کە لەو رۆژگارەدا بەرۆژو دەبوو تا شەو قسەی نەدەکرد.

کاتێك عیسای هێنایە دنیا، ئیبلیس هاتە لای منالەکانی ئیسرائیل و ئاگاداری کردنەوە کەمریەم منالی بووە و ئەوان بەخێرایی رویان تێکرد و بەتوندی وتیان. مریەم بەرێکەوت و عیسای بۆ لای خەڵکەکەی خۆی هێنا.

دەستەیەك دەڵێن: یوسفی دارتاش بۆ ماوەی چل رۆژ ئەوی لەئەشکەوتەکەدا هێشتەوە و دواتر ئەوی هێنا بۆناو کەس و کاری و ئەوان پێیان وت: ئەی مریەم کارێکی ناشیرین و نەشیاوت کرد. ئەباوکت پیاوێکی خراپ بوو و نەدایکت ژنێکی روسپی. تۆ چیت بەسەر هاتووە؟ مریەم لەرەچەڵەکی هارون برای، موسا بوو. وا دەڵێن و خوا زاناترە.

دەستەیەك دەڵێن ئەو لەنەژادی هارون برای موسا نەبوو بەڵکو لەتیرەی یەهودا کوڕی یەعقوب لەنەژادی سلێمان کوڕی داوودە. ئەم بنەماڵەیان بە((شیاوەکان))ناودەبرد و هارون لەمناڵەکانی لاوی کوڕی یەعقوبە.

مریەم بەوان ئەوەی وت خوا پێی فەرموبوو. کاتێك دوای ئەوە داوای قسە کردنیان لێکرد، ئیشارەتی بۆ عیسا کرد. ئەوان تورە بوون و وتیان: ئەوەی کەئێستا گاڵتەمان پێدەکات، دژواتر لەزینا کردنی ئەوە. وتیان: چۆن لەگەڵ کەسێکدا قسە بکەین کەهێشتا لەناو لانکەدایە؟ عیسا کەوتە قسە و وتی: من بەندەی خوام. ئەو نوسراوی بە من دا و منی کردە پێغەمبەرو لەهەر شوێنێك بەختەوەری کردم و منی تا ئەو کاتەی زیندوو بم بە نوێژ کردن و بەخشین لەرێگای خوا فەرماندا. یەکەم قسە کەکردی، لەبەندەبوونی خۆی لەبەرابەر خوا قسەی کرد تا بۆ ئەوی گومان دەکات ئەو (عیسا) خوایە، نیشانەیەکی دیارتر و ئاشکراتر بێت. خەڵك بەردیان هەڵگرتبوو تا مریەم بەردباران بکەن بەڵام کاتێك کورەکەی قسەی کرد، ئازادیانکرد. دوای ئەوە ئیتر قسەی نەکرد تا گەشتە هاوتەمەنی مناڵەکانیتر.

مناڵەکانی ئیسرائیل وتیان جگە لەزەکەریا کەس سکی ئەوی پڕنەکرد چوونکە ئەو بوو سەردانی مریەمی دەکرد. مناڵەکانی ئیسرائیل شوێنی کەوتن تا بیکوژن بەڵام ئەو رایکرد و ئەوان درەنگتر ئەویان دۆزییەوە و کوشتیان.
لەبارەی هۆکاری کوژرانی ئەو قسەیتریش وتراوە.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك کاتی لەدایك بوونی هات، خوا وەحی بەمریەم کرد: لەسەرزەمینی خەڵکەکەت برۆرە دەر چوونکە ئەگەر بەردەستیان کەویت سەرکۆنەت دەکەن و مناڵەکەت دەکوژن. یوسفی دارتاش هەڵیگرت و ئەوی بردە میسر. کاتێك گەشتنە سنورەکانی میسر، مریەم ژان گرتی، کاتێك مناڵەکەی هێنایە دنیا و خەمبار بوو، پێیان وت: خەمبار مەبە. خوا خورمای بۆ داباراند و ئەمە لەزستاندا بوو. بووتەکان سوجدەیان برد. دێوەکان ترسان و هاتنە لای ئیبلیس. کاتێك زۆری ئەوانی بینی، چۆنییەتی پرسی و ئەوان ئاگاداریان کردەوە. ئیبلیس وتی: لەزەوی روداوێکی سەیر رویداوە. فڕی و لەوان ونبوو. رۆشتە ئەو شوێنەی عیسا لێی لەدایك ببوو. فریشتەکانی بینی دەوریان گرتووە. زانی روداوی گەورە ئەمەیە. فریشتەکان رێگەیان پێنەدا لەعیسا نزیك ببێتەوە. ئیبلیس بۆ لای هاورێکانی خۆی گەرایەوە و وتی: هیچ ژنێك مناڵی نەبوو مەگەر ئەوەی لەوێ بووم هیوادارم. لەشوێنکەوتوانی ئەو زیاتر لەوە گومرا بکەم کەخۆی رێنویی دەکات.

مریەم ئەوی بردە سەرزەمینی میسر و دوانزە ساڵ مایەوە و عیسای لەخەڵك داشارد. ئەو دانەوێڵەی کۆدەکردەوە و لانکەی عیسایی لەکۆڵدابوو.

دەڵێم: وتاری یەکەم لەبارەی لەدایك بوونی لەسەرزەمینەکەی خۆی و خەڵکەکەی راستتر و لەوتەی قورئان نزیکترە چوونکە خوای گەورە دەفەرمێت: مریەم ئەوی بردە لای خەڵکەکەی خۆی و دەڵێت: ئەوان وتیان چۆن لەگەڵ مناڵێك قسە بکەین کەهێشتا لەلانکەدایە.

دەستەیەك دەڵێن: مردیەم دوای لەدایك بوونی مەسیح ئەوی بردە میسر و یوسفی دارتاشی لەگەڵدابوو. ئەمە هەمان (ربووە) یا بەرزایی لەسەر زەوییە کە خوای گەورە ئاماژەی پێداوە (مۆمنون/٢٣/٥٠). دەستەیەك دەڵێن: ئەو بەرزاییە دیمەشق یا بیت المقدسە و هەروەها بەشوێنیتریش وتراوە. هۆکارەکەی، ترس لەپاشای مناڵەکانی ئیسرائیل بووکە لەرۆمیەکان بەناوی هیرۆدۆس بوو. یەهودییەکان ئەویان بۆکوشتنی

عیسا هاندەدا و لەبەر ئەمە دایك و كوڕ روویان كردە میسر و دوانزە ساڵ لەوێ مانەوە تا ئەو پاشایە مرد و دواتر بۆ شام گەڕانەوە. دەستەیەك دەڵێن: هیرۆدۆس خوازیاری كوشتنی عیسا نەبوو و تەنیا دوای بەرز بوونەوەی بۆ ئاسمان بوو ناوی عیسای بیست. دایك و كچ لەیەهودییەكان دەترسان. و خوا زاناترە.

## داستانی پێغەمبەر (د.خ)ی عیسا و هەندێك لەمۆجیزەکانی ئەو

کاتێك مریەم لەمیسر بوو، لای جوتیارێك تێپەری کەهەژار و نەدارەکان رویان تێدەکرد. شتێکی لێ دزرابوو. ئەو تۆمەتی لەهەژارەکان دا و مریەم خەمبار بوو. کاتێك عیسا خەمی دایکی بینی، وتی: ئایا دەتەوێت ئەو بۆ خواستەکەی رێنویی بکەم؟ وتی: بەڵێ. عیسا وتی: ئەو پیاوە کوێرە وئەو پەککەوتەیە دزیویانە و تیایدا بوونە شەریك. کوێر پەککەوتەکەی کۆڵ دەکرد و ئەو هەڵیگرت. بەکوێریانوت، پەککەوتەکە کۆڵ بکە. ئەو ناتەوانی نیشاندا. مەسیح پێی وت : دوێ شەو کەزێرەکانت دزی چۆن توانیت کۆڵی بکەیت. ئەو دووانە شەرم دایگرتن و زێرەکەیان گەڕاندەوە.

ئەو جوتیارە میوانی بۆ هات و خواردنەوە لەئارادا نەبوو. جوتیار خەمبار بوو. کاتێك عیسا خەمی ئەوی بینی، رۆشتە ماڵی جوتیار و شوێنێك کەدوو ریز گۆزەی لێبوو. عیسا دەستی خۆی خستە سەر گۆزەکان و لایانەوە تێپەری و ئەو گۆزانە پڕبوون لەشەرابی ناب.

ئەو لەقوتابخانە بەمناڵەکانی دەوت ئێستا کەس و کاریان چی دەخۆن و چی دکەن.

وهب دڵێت: رۆژێك عیسا لەگەڵ مناڵەکان یاری دەکرد، لەناکاو کورێك پەلاماری یەکێتری دا و بەشەق تێیهەڵدا و کوشتی و ئەوی خوێناوی خستە بەردەمی عیسا. ئەویان بۆ داوەری بردە لای داوەری شارەکە و وتیان ئەو کورەکەی ئێمەی کوشتووە. فەرمانرەوا لێی پرسی و ئەو وتی: من نەمکوشتووە. ویستیان لێی بدەن و عیسا وتی: کوژاروەکە بێنن تا لێی بپرسم کێ کوشتوویەتی. لەوتەکەی سەریان سورما و ئەویان بردە لای کوژراوەکە. لەخوا پاڕایەوە و خوا کوژراوەکەی زیندوو کردەوە و عیسا لێی پرسی: کێ تۆی کوشت. وتی: فلان(یانی ئەوەی بەراستی کوشتبووی). مناڵەکانی

ئیسرائیل بە کوژراوەکەیان وت: ئەمە کێیە؟ وتی: عیسا کوڕی مریەم و کورەکە دەستبەجێ مردەوە.

عەتا دەڵێت: مریەم عیسای بەرەنگرێژێك سپارد تا لای ئەو رەنگرێژی فێرببێت. لەمکاتەدا قوماشی فراوانیان بۆ لای رەنگەرێژ هێنا و کارێکی گرنگی بۆ هاتە پێش. ئەو بەمەسیحی وت: ئەمە قوماشن بەرەنگی جۆراوجۆر. من لەهەرکام پەتێك لەو رەنگەی دەبێت پێی رەنگ بکرێت، دامناوە. هەرکام بەو رەنگەی وتم، رەنگ بکە تا دەگەڕێمەوە. عیسا ئەوانی هەڵگرت وهەموویانیکردە ناو یەك رەنگەوە. کاتێك رەنگرێژ گەرایەوە، لەبارەی قوماشەکان لێی پرسی. عیسا وتی: هەموویانم رەنگ کرد. وتی: لەکوێن؟ عیسا وتی: لێرەدان. رەنگرێژ وتی: هەموویان. عیسا وتی: بەڵێ. رەنگرێژ وتی: هەموویت بۆ خاوەنەکانیان لەناو برد. ئەو لەعیسا توڕە بوو، عیسا وتی پەلەمەکە و لێیان بڕوانە. هەستا و هەموویانی دەرهێنا و هەرکام بەو رەنگە بوو کە خاوەنەکەی داوای کردبوو. رەنگرێژ سەری سوڕما و زانی ئەمە مۆجیزەیەك لای خوای گەورەیە.

کاتێك عیسا هاورێ لەگەڵ دایکی بۆ شام گەڕانەوە، لەدێهاتێك بەناوی ناسرە مانەوە و شوێنکەوتووانی ئەو (نصارا) لەم ناوەوە ناویان وەرگرتووە. ئەو لەوێ مایەوە تا گەشتە تەمەنی سی ساڵی. خوا وەحی پێکرد لەبەردەم خەڵك خۆی ئاشکرا بکات و ئەوان بۆ پەرستنی خواوەند هان بدات و نەخۆش وپەك کەوتەکان وکوێرانی سکوما و گول و نەخۆشەکانیتر چاك بکاتەوە. ئەمکارەی کرد و خەڵك ئەویان زۆر خۆش دەویست و شوێنکەوتووانی زۆر بوون و ناو وناوبانگی بەدەست هێنا.

رۆژێك لەسەر سفرەی پاشایەك دابەزین کەخەڵکی بۆ بانگێشت کردبوو. ئەو لەسەر قاپێك دانیشتبوو و لێی دەخوارد و خواردن کەم نەدەبوویەوە. پاشا پرسی: تۆ کێیت؟ وتی: عیسا کوڕی مریەم. پاشا لەتەختەکەی هاتە خوار و لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی بوونە شوێنکەوتویی ئەو و ئەمانە بوون بەحەوارییەکان.

دەستەیەك دەڵێن: حەوارییەکان هەمان رەنگرێژ و هاورێکانی بوون. دەستەیەکیتر

دەڵێن: راوچییەکان بوون. دەستەیەك دەڵێن: جوتیاران بوون و خوا زاناترە. ژمارەی حەوارییەکان (هاوەڵە تایبەتەکانی عیسا)دوانزە پیاو بوو. کاتێك ئەوان برسی یا تینو دەبوون دەیانوت: برسین وتینوین. ئەودەستی خۆی لەزەوی دەدا و بۆ هەرکام دوو نانی دەهێنا، دەیانخوارد و ئەو ئەندازە لەئاو کە دەیانویست، دەیانخواردەوە. ئەوان وتیان: کێ لەئێمە لەپێشترە؟ هەرکات بمانەوێت دەخۆین و دەخۆینەوە. عیسا بەوانی وت: لەپێشتر لەئێوە کەسانێکن لەدسترەنجی خۆیان دەخۆن. دوای ئەوە ئەوان جل و بەرگیان دەشۆری و کرێیان وەردەگرت.

کاتێك خوا ئەوی وەك پێغەمبەر هەڵبژارد، پەیکەرێکی لەگڵ هاوشێوەی مریشك دروست کرد و فووی تێکرد وبە فەرمانی خوا بوو بەمریشك و ئەمە هەمان شەمشەمەکوێرەیە.

لەزەمانی ئەو زانستی پزیشکی باڵادەست بوو و ئەو توانایی نیشاندا کەبەهۆیەوە کوێری سکوما و گولی باش دەکردەوە و مردووەکانی زیندوو دەکردەوە و ئەوە بۆ ناتەوان کردنی ئەوان بوو(وشەی مۆجیزە بە مانانی ناتەوانکەرە). لەناو ئەو کەسانەی زیندووی کردنەوە، عازر لەهاورێکانی خۆی بوو. عازر نەخۆش کەوت و خوشکەکەی پەیامی بۆ عیسا نارد کەعازر دەمرێت. عیسا رۆشت بۆ لای و دووری نێوانیان سێ رۆژ بوو. ئەو گەشت و عازر سێ رۆژ بوو مردبوو. عیسا لەخوا پاڕایەوە و ئەو زیندوو بوویەوە و ئەوەندە ژیا و مایەوە تا منالی هێنایە دنیا. ئەو سام کوڕی نوحی زیندوو کردەوە. رۆژێك لەگەڵ حەوارییەکان بوو و بیری تۆفانەکەی نوحیان دەکردەوە کەوتیان: کەسێك زیندوو کەرەوە شایەتی ئەم روداوە بێت. ئەو هاتە سەر تەپۆڵکەیەك و وتی: ئێرە ئارامگای سام کوڕی نوحە. دواتر لەخوا پاڕایەوە، ئەو زیندوو بوویەوە و وتی: ئایا رۆژی هەستانەوەیە؟ مەسیح وتی: نە بەلآم من داوام لەخوا کرد و ئەو تۆی زیندوو کردەوە. حەوارییەکان داستانی تۆفانەکەی نوحیان لێپرسی وئەو گێرایەوە و دواتر مرد. ئەو عوزەیری پێغەمبەری زیندوو کردەوە چوونکە منالەکانی ئیسرائیل پێیان وت: ئەومان بۆ زیندوو کەرەوە وەگەرنە

دەتسوتێنین. ئەو لەخواپاڕایە و عوزەیر زیندوو بوویەوە. منالەکانی ئیسرائیل بەعوزەیریان وت: بۆ ئەم پیاوە چۆن شایەتی دەدەیت؟ عوزەیر وتی: شایەتی دەدەم ئەو پێغەمبەری خوا و بەندەی ئەوە. ئەو یەحیا کوڕی زەکەریای بۆ ژیان گەڕاندوە. عیسا لەسەر ئاو بەرێگادا دەڕۆشت.

## داستانی دابەزینی سفرە

یەکێك لەموٓجیزە گەورەکانی ئەو دابەزینی سفرە بوو.
هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو حەوارییەکان وتیان: ئەی عیسا، ئایا خواکەی تۆ دەتوانێت سفرەیەکمان لەئاسمانەوە بۆ بنێرێت؟ عیسا لەخوا پاڕایەوە و وتی: ئەی خوایە، ئەی ئافرێنەری ئێمە، بۆمان لەئاسمانەوە سفرەیەك بنێرە تا بۆ ئێمە جەژنێك بێت بۆ یەکەمینمان و بۆ دوایین کەسمان(مائدە/٥/١١٢—١١٤). خوا سفرەکەی نارد کەگۆشت و نانی تیا بوو، لێیان دەخوارد و سفرە کەمی نەدەکرد. عیسا بەوانی وت: ئەم سفرە بەردەوام دەمێنێتەوە مەگەر ئەوەی شتێکی لێ پاشەکەوت بکەن. هێشتا شەو دانەهاتبوو کەلێیان هەلگرت و پاشەکەوتیان کرد. دەڵێن: فریشتەکان هاتن و سفرەکەیان لەگەڵ خۆیان هێنا کەحەوت نان و حەوت ماسی لەسەر بوو و یەکەم کەسان تا دوایین کەسان لێیان خوارد. دەستەیەك دەڵێن ئەو سفرە پڕبوو لەمیوە بەهەشتییەکان. دەستەیەك دەڵێن: هەر خواردنێك جگە لەگۆشت دەهاتە سەر ئەو سفرە. دەستەیەك دەڵێن: ماسییەك بوو تامی هەموو خواردنەکانی بوو و کاتێك لێیان خوارد(ژمارەیان پێنج هەزار کەس بوو و خواردنەکەی زیادی دەکرد و گەشتە ئەژنۆی ئەوان) وتیان: شایەتی دەدەین تۆ نێردراوی خوایت. ئەوان بلاوەیان لێکرد و لەو بابەتە دەدوان و کەسانێك لەوێ نەبوون، بەدرۆیان دەزانی و وتیان: ئەو چاوەکانی ئێوە جادوو کرد. دەستەیەك فریودران و ناباوەڕیان کردە پیشە، بوونە ورچ و لەناو ئەوان ژن و منالْ نەبوو. ئەوان سێ رۆژ لەو روخسارەدا مانەوە و دواتر لەناو چوون و منالْیان نەهێنایە دنیا.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو سفرە پارچەیەکی سوور لەژێر هەورێکدا بوو و لەسەریشی هەورێکبوو. ئەوان سەیریان دەکرد کەدابەزی و لەبەرابەری ئەوان ڕاخرا. عیسا گریا وتی: خوایە من لەسپاسگوزاران دابنێ. شتێکیان بینی هاوتایان نەبینیبوو و بۆنێکیان کرد بەو خۆشییە بۆنیان نەکردبوو. شەمعون وتی: ئەی گیانی خوا، ئایا ئەم خواردنانە هی ئەم دنیایە یا لەخواردنەکانی بەهەشتە؟ مەسیح وتی: نە

لەخواردنەکانی ئەم دنیایە نە لەخواردنەکانی بەهەشتە، شتێکە خوابەهێزی خۆی دروستی کردووە. مەسیح بەوانی وت: لەوەی داواتان کردووە، بخۆن. ئەوان وتیان: تۆ لێی بخۆ ئەی گیانی خوا. مەسیح وتی: پەنا بەخوا ئەگەر لێی بخۆم. ئەو نەیخوارد و ئەوان نەیانخوارد و مەسیح پیر و پەککەوتە و نەخۆش و هەژارەکانی تێرکرد و لێیان خوارد و ژمارەیان هەزار و سێسەد کەس بوو. هەمووان تێربوون و ئەو سفرە بەردەوام پڕبوو بێ ئەوەی کەم بکات. نەخۆش و پەککەوتەکان چاکبوونەوە و هەژارەکان بێ نیاز بوون. دواتر سفرەکە بەرز کرایەوە و ئەوان سەیریان دەکرد تا لەچاو ونبوو. حەوارییەکان پەشیمان بوونەوە کەلێیان نەخوارد.

دەستەیەک دەڵێن: بۆ چل ڕۆژ دەهاتە خوار. ڕۆژێك دەهات و ڕۆژێك نەدەهات. خوا بەعیسای فەرموی، هەژارانی لێ تێربکات. ئەمکارەی کرد و لەسەر ساماندارەکان قورس تەواو بوو و ئەوان دابەزینی سفرەکەیان بەدرۆ دەزانی و گومانیان لێکرد و گومانیان لای خەڵکانی دیکەش دروست کرد. خوا وەحی بەعیسا کرد: پەیمانم داوە ئەوانەی بەدرۆی دادەنێن ئەشکەنجەیەکی وابکەم کەهیچ کام لەجیهانییەکانم ئەو ئەشکەنجەیە نەبینێت. خوا سێسەد و سی و سێ کەسی لەوان کردە ئاژەڵ و ئەوان بوون بەورچ. کاتێك خەڵك ئەمەیان بینی، لای عیسا گریان و پارانەوە و عیساییش بۆ ورچەکان گریا. کاتێك ورچەکان گریانی عیسایان بینی، گریان و بەدەوری ئەودا سوڕانەوە و ئەو یەکیەکیانی بەناو بانگ کرد و ئەوان سەریان بەرز دەکردەوە بەڵام نەیاندەتوانی قسە بکەن. سێ ڕۆژ لەو حاڵەدا مانەوە و دواتر لەناوچوون.

## داستان بەرز بوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان وگەڕانەوەی بۆ لای دایك و گەڕانەوەی بۆ ئاسمان

دەڵێن: ڕۆژێك دەستەیەك لەجولەكەكان چاویان بەعیسا كەوت و كاتێك ئەویان بینی، وتیان: جادوگەری لەجادوگەر بوو، حەرامزادەی لەحەرامزادەبوو، هات. ئەوان ئەو و دایكیان بەداوێنپیس ناوزەد كرد. ئەو ئەمەی بیست ولای خوا گلەیی لەوان كرد و خوا وەڵامی دایەوە و ئەوانی كرد بەورچ. كاتێك گەورەی منداڵەكانی ئیسرائیل ئەمەی بینی، ترسا وجولەكەكان بۆ كوشتنی ئەو بەڵێنیان دا. لێی كۆبوونەوە و لێیان پرسی و ئەو وتی: ئەی خوڵكی یەهود، خوا ئێوە بەدوژمن دەزانێت. ئەوان لەوتەكانی ئەو تووڕە بوون و هەستان بیكوژن. خوا جبرەئیلی نارد كە ئەوی لەدەرگایەكی بچوكەوە بردە ماڵێكیتر كەدەلاقەیەكی تیابوو. خوا لەو دەلاقەوە بۆئاسمان بەرزی كردەوە. گەورەی جولەكەكان بەپیاوێك لەهاوەڵانی خۆی بەناوی فتیبانوس(فلتیانوس) فەرمانیدا بڕواتە ئەو ماڵە و بیكوژێت. ئەو ڕۆشتە ماڵەكە و كەسی نەبینی و خوا ڕوخساری مەسیحی خستە سەر ڕوخساری ئەو. ئەو هاتەدەر و ئەوان ئەویان بەمەسیح زانی و كوشتیان و لەداریاندا.

دەستەیەك دەڵێن: عیسا بەهاوڕێكانی خۆی وت: كام یەك لەنێوە دەیەوێت ڕوخساری من بكەوێتە سەر ڕوخساری ئەو و بكوژرێت؟ پیاوێك لەناویاندا وتی: من، ئەی گیانی خوا. ڕوخساری مەسیح خرایە سەر ڕوخساری ئەو و ئەویان كوشت و لەداریاندا (لەداریاندا و كوشتیان).

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی هاوشێوەی عیسا بوو و كوژرا، پیاوێكی ئیسرائیلی بەناوی یوشەع بوو.

دەستەیەك دەڵێن: كاتێك خوا مەسیحی ئاگادار كردەوە بەناچاری دەبێت لەم دنیایە بڕوات، ئەو لەمردن ترسا و حەوارییەكانی بانگ كرد و خواردنێكی بۆ دروست كردن و وتی: ئەمشەو وەرنە لای من چوونكە نیازێكم بەنێوەیە. كاتێك هاتن، شێوی پێدان

و لەسەریان وەستا و میوانداری کردن. کاتێك شێویان تەواو کرد هەستا و بەدەستی خۆی دەستی ئەوانی شۆرد و بەجلی خۆی بۆی وشك کردنەوە. ئەوان ئەم کارەیان بەگەورە زانی و پێیان ناخۆش بوو. وتی: هەر کەس لەوەی ئەمشەو بۆی دەکەم بۆ منی بگێرێتەوە، لەمن بەدوور بێت. ئەوان هیچیان نەکرد تا تەواو بوو. وتی: ئەوەی لەسەر سفرە میوانداری و پەرستاری ئێوەم کرد و دەستی ئێوەم بەدوو دەستی خۆم شۆرد، بۆ ئەوە بوو من بکەنە نمونەی خۆتان و وەك من هەڵس وکەوت بکەن و خۆتان بەگەورەتر لەیەك مەزانن. نیازێکم بەئێوەم هەیە و لەئێوە بۆ ئەنجامدانی هاوکاریم دەوێـت، ئەوەیە لەخوا بۆمن بپارێنەوە و لەدۆعا کردن بۆ من هەوڵ بدەن تا مەرگی من دوا بخات. کاتێك خۆیان بۆ دۆعا کردن و پاڕانەوە ئامادە کرد، خەو ئەوانی گرتەوە و هیچ کام نەیانتوانی لەخوا بپارێنەوە. ئەوانی بەئاگا دەهێنایەوە و دەیوت: پەنا بەخوا! یەك شەو نەتانتوانی بۆمن خۆراگری بکەن؟ وتیان: سوێند بەخوا نازانین چیمان بەسەر هاتووە. ئێمە بەردەوام بەئاگا دەمانیەوە و شەوان تا بەیانی دەپاڕاینەوە بەڵام ئەمشەو ناتوانین. هەرجار دەمانەوێت لەخوا داوا بکەین، ناتەوان دەبین. عیسا وتی: شوان دەڕوات و مەڕومالاَتەکەی بەرەلاَ دەکات. ئەو بەردەوام مەرگی خۆی بیری ئەوان دەخستەوە. دواتر وتی: پێش ئەوەی کەڵەشێر بخوێنێت، یەکێك لەئێوە بێ گومان بەمن کافر دەبێت و هەروەها یەکێك لەئێوە من بەچەند درەمێکی بێ بەها دەفرۆشێت و بەهاکەی من دەخوات.

ئەوان هاتنەدەر و بڵاوەیان لێکرد. جولەکەکان کەبەدوایدا دەگەڕان یەکێك لەحەوارییەکانیان – شەمعون- گرت و وتیان: ئەمە لەهاوڕێکانی ئەوە.

زاناکان لەبارەی مەرگی ئەو و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان بیروڕای جیاوازیان هەیە. دەستەیەك دەڵێن بۆ ئاسمان ڕۆشت و نەمرد. کاتێك بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە، خواپێی فەرموو: بڕۆرە ناو. کاتێك لەگەڵ شەمعون لەبارەی عیسا قسەیان دەکرد، حاشای کرد و وتی: من لەهاوڕێکانی ئەو نیم. ئەوان ئەویان بەرەلاَ کرد. سێ جار ئەم کارەیان دووبارە کردەوە و کاتێك خوێندنی کەڵەشێری بیست، خەمبار بوو و گریا. یەکێك لەحەوارییەکان هاتە لای جولەکەکان و شوێنەکەی مەسیحی نیشاندان و ئەوان سی درەمیان پێدا. ئەو لەگەڵ ئەوان ڕۆشتە ماڵی عیسا و ڕۆشتە ناو. خوا

مەسیحی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و روخساری ئەوی خستە سەر ئەو پیاوەی جولەکەکانی بۆ لای عیسا رێنوێنی کردبوو. ئەوان گرتیان و بەستیانەوە و رایانکێشا. بەردەوام دەیانوت: تۆ مردووەکانت زیندوو دەکردەوە و ئەم کارە و ئەو کارەت دەکرد. ئێستا بۆ خۆت رزگار ناکەیت؟ ئەو دەیوت: من ئەو کەسەم عیسام بەئێوە نیشاندا. ئەوان گوێیان لەقسەکەی نەگرت و ئەویان بەرەو داری ئیعدام برد و لەداریان دا.

دەستەیەک دەڵێن: کاتێک ئەو حەوارییە، عیسای بەجولەکەکان نیشاندا، بەدوای ئەودا بەرێکەوتن و ئەویان لەومالەی تیایبوو گرت تا لەداری بدەن. لەم کاتەدا زەوی تاریک بوو و خوا فریشتەکانی نارد و روخساری عیسایان خستە سەر ئەو کەسەی عیسای بەجولەکەکان نیشاندابوو. ئەویان گرت تا لەداری بدەن و ئەو دەیوت: من ئەو کەسەم عیسام بەئێوە نیشاندا. ئەوان سەیریان نەکرد و کوشتیان. خوا سێ کاتژمێر دوای گرتنی گیانی عیسا ئەوی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. دەستەیەک دەڵێن: حەوت کاتژمێربوو. دواتر خوا ئەوی زیندوو کردەوە و بۆ ئاسمانی بەرز کردەوە. خوا پێی فەرموو: بڕۆرە لای مریەم چوونکە هیچ کەس بەئەندازەی ئەو بۆتۆ خەمبار نییە و نەگریا. عیسا دوای حەوت رۆژ هاتەخوار. کاتێک دابەزی، کێو لەروناکی زۆر ئاگری گرت و مریەم بەهەمان شێوە لەبن داری ئیعدامدا بوو و دەگریا. لەگەڵ ئەودا ژنێک بوو کەعیسا لەشێتی رزگاری کردبوو. عیسا بەو دوو ژنەی وت: بۆ دەگرین؟ وتیان: بۆ تۆ. عیسا وتی: خوا منی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و جگە لەچاکی و باشی هیچیترم نەبینیوە. ئەم پیاوە دەیبینن ئەو کەسەیە بۆ ئەوان نامۆیە (و ئەو لەدار دراوە نەمن). عیسا بەمریەمی فەرموو حەوارییەکانی بۆ کۆبکاتەوە و عیسا ئەوانی بەناوی پێغەمبەرانی خوا لەسەر زەوی بلاو کردەوە و فەرمانی دا ئەوەی خوا فەرمانی پێداوە لەلایەن ئەوەوە بە گوێی خەڵکی دنیا بگەیەنن. دواتر خوا ئەوی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و جلێکی لەپەڕی لەبەر کرد و خۆشی خواردن و خواردنەوەی لێ سەندەوە و سەراسەری جەستەی کردە روناکی و لەگەڵ فریشتەکان هەڵفڕی و ئێستا لەگەڵ ئەوانە. ئەو پیاوێکی فریشتەی۔ خەڵکە و زەمینی و ئاسمانییە۔

حەوارییەکان بلاو بوونەوە. شەوێک کەخوا عیسای بۆ ئاسمان برد، ئەو شەوەیە

مەسیحیەکان دووکەڵی تیا بەرز دەکەنەوە.

جولەکەکان دەستی ستەم و زۆرداریان بۆ سەر حەواریەکانیتر بلاّو کردەوە و ئەوانیان ئەشکەنجە دەدا و جنێویان پێدەدان. پاشای رۆم کەناوی هیرۆدۆس بوو و جولەکەکان لەژێر دەستی ئەودابوون، ئەمەی بیست و پێیان وت: پیاوێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل بوو کەنیشانەکانی خوایی دەهێنایەوە و مردووەکانی زیندو دەکردەوە و پەیکەری دروست کراو لەقوڕی گیان دەبەخشی و هەڵدەفڕاند. جولەکەکان هێرشیان کردە سەر و ئەویان کوشت. بەوانی دەوت کەپێغەمبەری خوایە. پاشا وتی: هاوار لەئێوە، بۆ ئەمەتان زووتر بەمن نەوت؟ سوێند بەخوا ئەگەر ئەمەم دەزانی، دەستی جولەکەکانم لەسەر ئەو کورت دەکردەوە. دواتر پەیامی بۆ حەوارییەکان نارد و لەبارەی ئایینی عیسا پرسیاری لێکردن و ئەوان پێیان وت. ئەو بووە شوێنکەتووی دینی ئەوان و پیاوی لەخاچ دراوی لەدار هێنایە خوار و شاردییەوە. ئەو دارەی عیسای پێ لەخاچ درابوو، هەڵیگرت و رێزی لێگرت و پاراستی و هێرشی کردە سەر مناڵەکانی ئسرائیل و زۆر لەوانی کوشت. لێرەوە بوو ئایینی مەسیحی لەرۆمەوە سەرچاوەی گرت وبناغەی بۆ دارێژرا و لێرەوە بوو ئایینی مەسیحی لەرۆمدا بلاّوبوویەوە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم پاشایە کەناوی هیرۆدۆس بوو، نوێنەری پاشای گەورەی رۆم قەیسەر و ناوی تیباریۆس بوو و ئەم پیاوەیش بەپاشا ناودەبرا. رۆژگاری پاشایەتی تیباریۆس بیست و سێ ساڵ درێژەی کێشا. هەژدە ساڵ و چەند رۆژێك تێپەری کەعیسا بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە.

## پاشاکانی رۆم دوای رۆشتنی عیسا بۆ ئاسمان تا رۆژگاری پێغەمبەر (د.خ)ی ئێمە محەمەد

دەڵێن سەراسەری پاشایەتی رۆم دوای تیباریۆس بەکورەکەی گایۆس گەشت و رۆژگاری پاشایەتی ئەو چل ساڵی خایاند. دوای ئەو ئەم کەسانە بەمشێوە پاشایەتی رۆمیان کردەوە: کورەکەیتری بەناوی کلۆدیۆس ١٤ ساڵ، نێرۆن ( کە پترۆس و پۆلسی سەرەوخوا لەداردا) ١٤ ساڵ، پوتلایس ٤ مانگ، ئەسفسیانوس (کە کورەکەی بۆ بیت المقدس نارد و وێرانی کرد و زۆر لەمناڵەکانی ئیسرائیلی لەتۆڵەی خوێنی عیسادا کوشت) کورەکەی تیتۆس، براکەی دومتیانوس ٦ ساڵ، نارواس، ٦ ساڵ، ترایانوس ١٩ ساڵ، هدریانوس ١١ ساڵ، ئانتۆنینوس کوری بتیانوس ١٢ ساڵ، مرکوس و کورەکانی ١٩ ساڵ، کۆمودوس ١٣ ساڵ، فرتیناگوس ٦ مانگ، سیواروش ١٤ ساڵ، ئانتینانوس ٧ ساڵ، مرکیانوس ٦ ساڵ، ئانتینانوس ٦ ساڵ کە لەرۆژگاری ئەو جالینوسی پزیشك مرد. ئالخەندەروس(ئالکساندروس، ئالخاندروس) ١٣ ساڵ، ماکسیمانوس ٣ ساڵ، گوردیانوس، ٦ ساڵ، فیلفەس، ٧ ساڵ، داکیوس(دسیوس) ٦ ساڵ، کالوس ٦ ساڵ، والریانوس و کالینوس ١٥ ساڵ، کلاودیوس ١ ساڵ، کریتالیوس ٢ مانگ، ئورلیانوس ٥ ساڵ، تیکتوس ٦ مانگ، فۆلۆرنوس ٢٥رۆژ، فروبووس ٦ ساڵ، دکاتیانوس ٦ ساڵ، مەکسیمیانوس ٢٠ ساڵ، کۆنستانتین ٣٠ ساڵ، یولیانوس (ژولیان) ٢ ساڵ، یویانوس یەك ساڵ، والنتیانوس و گرتیانوس ١٠ ساڵ، کرتیانوس و والنتیانوسی بچوك یەك ساڵ، تیسادیس گەورە ١٧ ساڵ، والنتیانوس ١٦ ساڵ، مرکیانوس ٧ ساڵ، لاوست ١٦ ساڵ، زانون ١٨ ساڵ، ئافستاس ٢٧ ساڵ، یوستنیانوس (ژوستینین) ٩ ساڵ، یوستنیانوسی چیر ٢٠ ساڵ، یوستینس ١٢ ساڵ، تیباریوس ٦ ساڵ، مریکیش و کورەکەی تاداسیس ٢٠ ساڵ، فوکا کەکوژرا ٧ ساڵ و شەش مانگ. هێرقل کە پێغەمبەری ئیسلام نامەی بۆ نوسی ٣ ساڵ.

بەپێی وتاری ئەوان، لەکاتی دروست کرانی بیت المقدس دوای وێران بوونی لەسەر دەستی بخت النسر، تا کۆچی پێغەمبەری ئیسلام هەزار و چەند ساڵ و لەپاشایەتی ئیسکەندەر تا کۆچ نۆسەد و بیست و چەند ساڵە.

لەم ناوەدا، لەکاتی دەرکەوتنی ئەو تا لەدایك بوونی عیسا ٣٠٣ ساڵ و لە لەدایك بوون

تا بەرز کرانەوە بۆ ئاسمان سی و دو ساڵ و لەرۆشتنی ئەو بۆ ئاسمان تا کۆچ پێنسەد و هەشتا و پێنج (٥٨٥) ساڵ و چەند مانگە.

ئەم ناوهێنانی پاشاکانی رۆم باوکی جەعفەر (محەمەد کوڕی جەریری تەبەری) ئاماژەی پێداوە بەڵام ناوبردنی ئەوانی لەرووداوەکانی رۆژگاری خۆیان بێبەش کردووە. زاناکانیتر لەگەڵ مێژوودا نوسیویانە و زۆربەیان بیروراکانیان جیاواز و کەسانیتر کەهاوباوەڕی ئەون، لەناوەکاندا جیاوازیان هەیە و چەندین ناویان لەگەڵ چەندین روداو پێ زیاد کردووە.

من بەخواستی خوا بەشێوەیەکی چڕ و پڕ ئاماژەی پێدەدەم.

## ئامارژەدان بە پاشاکانی رۆم کەسێ توێژن
## توێژی یەکەم صائبان

زۆرینەی زاناکانی مێژوو نوسیویانە رۆمیەکان بەسەر یۆنانییەکاندا زاڵ بوون و ئەوان منداڵەکانی سۆفیر بوون. ئیسرائیلیەکان دەڵێن ئەمە هەمان سۆفیری بچوك کوری ئەفەر کوڕی عەیس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمە. ئەوان دوای زاڵبوون بەسەر یۆنان لەرۆمیە دەژیان و پێش مەسیحی، ئایینی سائبیان هەبوو. ئەوان بتیان هەبوو بەشێوەی سائب دەیانپەرستی. یەکەم پاشاکان لەرۆمیە گالیلۆس بوو کەهەژدە ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. دەڵێن پاشایەتی ئەو پێش لەرۆملس و ئەرمانوس بوو. ئەم دووانە بناغەیان بۆ دانا و دروستیان کرد. ئەوێ بەم ناوە نابرا و رۆم پەیوەستی بوو. گالیوس یەکەم کەسە لەمێژوودا ناوی براوە چوونکە زۆر بەناوبانگ بووە. دوای ئەو یۆلیوس ٤ ساڵ و ٤ مانگ فەرمانرەوایەتی کرد ودوای ئەو ئەوغستس بوو بەپاشا و ئەو بوو بەقەیسەر ناوبرا. داستانی ئەم پاشایە بەمشێوەیە کە لەکاتی لەدایك بوونی دایکی مرد و سکیان هەڵدڕی و ئەویان هێنایە دەر. دواتر ئەم وشەیان بۆ پاشاکانی خۆیان ناودەبرد. رۆژگاری پاشایەتی ئەو ٥٦ ساڵ و ٥ مانگ بوو. زۆرینەی مێژوو نوسان بەناوی ئەو دەست پێدەکەن چوونکە یەکەم کەس بوو لەرۆمیە هاتەدەر و سوپای لەدەشت و دەریادا خستە رێ و شەڕی لەگەڵ یۆنانییەکاندا کرد و بەسەر ئەواندا زاڵ بوو. ئەو دوایین پاشاکەیان قلوبترە (کلیۆپاترا)ی کوشت و بەسەر ئەسکەندەرییە زاڵ و سامانەکانی بۆ رۆمیە برد و دەستی بەسەر شامدا گرت. دەوڵەتی یۆنانییەکان لەناوچوو و بوونە پاشکۆی دەوڵەتی رۆم. ئەو هیرۆدۆش کوری ئانتیکوسی کردە فەرمانرەوایی بیت المقدس. لەساڵی چل و دووەمی پاشایەتی ئەو مەسیح چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەوکەسەیە بناغەی قەیسارییەی دارشت.

دوای ئەو تیباریۆس ٢٣ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و بناغەی تەبەرییەی دارشت و پەیوەستی فەرمانڕەوایەتی خۆی کرد خۆی و عەرەبەکان دواتر تەعریبیان کرد. لەسەردەمی پاشایەتی ئەو عیسا بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە. ئەو دوای ئەمە سێ ساڵ

فەرمانرەوایەتی کرد.

دوای ئەو کورەکەی گایوس ٤ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و ئەو کەسە بوو ئێستفنوس گەورەی شماسان لای مەسیحیەکان و یەعقوب برای یوحەننا کوڕی زوبدی(هەر دوك لەحەوارییەکان) و دەستەیەك لەمەسیحیەکانی کوشت. یەکەم پاشای بتپەرست بوو کوشتاری مەسیحییەکانی کرد.

دوای ئەو کلاودیوس کوڕی تیباریوس بۆ ماوەی ١٤ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و لەسەردەمی پاشایەتی ئەو شەمعون سەفا خرایە زیندانەوە و دواتر لەزیندان هاتەدەر و رۆشتە ئەنتاکیە و خەڵکی بۆ ئایینی مەسیحی بانگێشت دەکرد. دواتر رۆشتە رۆمیە و خەڵکی ئەوێشی بۆ لایەنگیری ئەم ئایینە هاندا و شاژنی ولات وەڵامی دایەوە و بەرەو بیت المقدس رۆشت و ئەو دارەی مەسیحییەکان گومانیان دەکرد عیسایی پێ لەدار دراوە، دەرهێنا. ئەم دارە لەدەستی جولەکەکاندا بوو. شاژن وەریگرت و تەسلیمی مەسیحیەکانی کردەوە.

دواتر نێرۆن ١٣ ساڵ و ٣ مانگ فەرمانرەوایەتی کرد و لەکۆتایی پاشایەتی ئەودا بوو پترۆس و پۆڵسی سەرەوخوار لەرۆمیە لەداردا. لەرۆژگاری ئەو جولەکەکان یەعقوب کوڕی یوسف یەکەم قەشەی مەسیحیەکانیان لەبیت المقدس گرت و کوشتیان و داری ئیعدامیان وەرگرت و لەژێر خاکدا شاردیانەوە. لەرۆژگاری ئەو مارینوس دەژیا کەنوسەری کتێبی (جوغرافیا) لەبارەی نوسینی شوێنەکانی سەرزەمین بوو.

دواتر فەرمانرەوایەتی بەمشێوە بوو: گلیاس ٧ مانگ، نوسۆن ٣ مانگ، بیتالیس ١١ مانگ، ئێسپاسیانوس ٧ ساڵ و ٧ مانگ، لەرۆژگاری ئەو دانیشتوانی بیت المقدس دژی قەیسەر راپەرین و ئەو گەمارۆی شاریدا و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و زۆر لەجولەکە و مەسیحیەکانی کوشت.

دوای ئەو کورەکەی تیتوس ٢ ساڵ و ٣ مانگ فەرمانرەوایەتی کرد و لەسەردەمی ئەو مرقیوس(مارسیۆن) وتاری خۆی لەبارەی دوو خوای چاکە و خراپە بڵاو کردەوە و

مرۆڤی بەسێیەم دیاردەی نێوانیان ناو برد( کە نیوە یەزدانی و ئاهورایی و نیوەی شەیتانی و ئەهریمەنییە). مرقونییەکان بۆ ئەو دەگەڕێنەوە. ئەو خەڵکی حەران بوو.

دواتر زومتیانس کوڕی ئێسپاسیانوس ١٥ ساڵ و ١٠ مانگ پاشایەتی کرد و ئەو لەنۆیەمین ساڵی پاشایەتی خۆی یوحەننای حەواری بۆ دوورگەیەك لەدەریا دوور خستەوە و دواتر گەڕاندییەوە.

دواتر ترایانوس ١٩ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. لەشەشەمین ساڵی پاشایەتی ئەو یوحەننا نوسەری ئینجیل لەشاری ئەفسیس مرد.

دواتر ئیلیا ئەندریانوس بۆ ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و بەهۆی ناسازگاری لەگەڵ جولەکە و مەسیحیەکان، ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت و بیت المقدسی وێران کرد ونەمە دوایین وێران کردن بوو. کاتێك هەشت ساڵ لەپاشایەتی ئەو تێپەری، سەرلەنوێ ئاوەدانی کردەوە و ناوی نا ئیلیا و ئەم ناوەی لەسەر مایەوە. پێشتر پێیان دەوت ئورشەلیم. ئەو ژمارەیەکی زۆری لەیۆنانییەکان و رۆمیەکان لەم شارەدا نیشتەجێ کرد و بینایەکی بەرز و گەورەی بۆ ناهید دروست کرد کەبڕێکی زۆری لەسەرەوە وێران بوو. ئەم بینایە تا ئەمرۆ ماوەتەوە (ئێستا ساڵی ٦٠٣ کۆچیە). من بینیومە و بینایەکی بەهێزە. نازانم بۆ، بۆ داوودی دەگەڕێننەوە کەرۆژگارێکی درێژ دوای ئەو دروست کراوە. من لەبیت المقدس لەژمارەیەکم بیست دەیانەوت داوود دروستی کردووە و تیایدا بەتەنیا خواپەرەستی دەکرد.
لەرۆژگاری ئەم پاشایە، ساقیدس فەیلەسوفی بێدەنگ دەرکەوت.

دواتر ئەنتنینس بیوس (ئانتۆنیۆس پیوس) بۆماوەی بیست ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و لەسەردەمی ئەو بتلیموس نوسەر و جوغرافیزانی بەناو بانگ دەرکەوت. دەستەیەك دەڵێن ئەو لەمناڵەکانی کلۆدیۆسە و لەبەر ئەمە ئەویان بەناوی کلۆدی یا

قلۆدی بانگ دەکرد. ئەو شەشەمین پاشای رۆم بوو. بەڵگەی ئەوەی لەم رۆژگارەدا بووە و لەپاشاکانی یۆنان هەژمار نەکرا، ئەوەیە لەکتێبی مەجستی وتوویەتی خۆی کەخۆری لەساڵی هەشسەد و هەشتا (٨٨٠) لەپاشایەتی بخت النسر رسەد کردووە. لەکوژرانی بخت النسر تا کوژرانی دارا چوارسەد و بیست و نۆ ساڵ (٤٢٩) ساڵ و سێسەد و شانزە رۆژ لەکوژرانی دارا تا لەناوچوونی پاشایەتی کلیۆپاترا دوایین پاشای یۆنانینەکان لەسەر دەستی نوغستس دوسەد و هەشتا و شەش ساڵ و لەزاڵبوونی نوغستس تا ئانتنینوس سەد و حەوت ساڵ بوو. لەبەر ئەمە، لەپاشایەتی بخت النسر تا ئادریانوس هەشسەد و هەشتاو سێ ساڵ دووری هەیە. ئەمە لەگەڵ وتەکەی بتلیموس یەك دەگرێتەوە.

دەڵێت: هەر کەس گومان بکات ئەو کوڕی کلیۆپاترا دوایین پاشای یۆنانییەکانە، بەهەڵەدا چووە. ئەمە دەستەیەك لەزاناکانی مێژوو باسیان کردووە و پاشاکانی یۆنانیان دیاری کردووە و پاشایەتی ئەوانیان لەسەر ئەم بنەمایە ئاماژە پێداوە. بەلاّم باوکی جەعفەری تەبەرەی لەدرێژی رۆژگاری پاشایەتی ئەوان ئاماژەی بە دووسەد و بیست و حەوت ساڵ داوە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

دوای ئەو مرقس بوو بەپاشا. بەئورلیوس یش ناویان بردووە و ١٩ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. لەرۆژگاری پاشایەتی ئەو کوڕی دیسان وتارەکەی خۆی بلاّو کردەوە. ئەو قەشەیەکە (رها) و بە دوو جەمسەری (دو سەرەتا بۆ چاکە و خراپە) باوەڕدار بوو. ئەو لەروبارێك لەسەر دەروازەی رها وەك بەرێوبەر دانرا کەئەویان لەوێ بە کوژراو بینی. لەسەر ئەم روبارە کەنیسەیەك دروستکرا.

دوای ئەو کۆمۆدوس بۆ ماوەی ١٢ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. لەرۆژگاری ئەو بوو جالینوس، هەستی بەبتلیموسی کلۆدی کردبوو. ئایینی مەسیحی لەسەردەمی ئەو ئاشکرا ببوو. ئەو لەکتێبەکەی بەناوی (کۆمەڵگاکانی کتێبی ئەفلاتون لەبارەی ولاّتداری) ئاماژەی بەوان داوە.

دواتر برتینکش ٣ مانگ، یولیانوس ٢ مانگ و سیوارس ١٧ ساڵ فەرمانرەوایەتیان

کرد. لەسەردەمی ئەمەیان، مەسیحیەکان و جولەکەکان گیرۆدەی کوشت وبڕ و ئازار وئەشکەنجە و دەربەدەری بوونەوە. ئەو لەئەسکەندەریە نوێژگەیەکی زۆر گەورەی دروست کرد و بەنوێژگەی خواکان ناوی برد.

دواتر ئانتۆنیوس ٦ ساڵ، مکرۆنیوس یەك ساڵ و دوو مانگ، ئانتۆنیوسی دووەم ٤ ساڵ، ئالاکساندرۆس (بەنازناوی مامیاس) ١٣ ساڵ، مەکسیمیانوس ٣ ساڵ، مەکسموس ٣ مانگ، فەرمانرەوایەتیان کرد.

دواتر فیلوس بۆ ماوەی شەش ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. ئەو بووە شوێنکەوتوی ئایینی مەسیحی و لەدینی سابی وازی هێنا و زۆربەی خەڵکی وڵاتەکەی لایەنگریان لێکرد. لەبەر ئەمە لەناو خەڵکەکەی ناسازگاری دروست بوو. یەکێك لەوان رێگەی ناسازگاری گرتەبەر، بەتریقێك بەناوی داکیوس بوو کەفیلوسی کوشت و دەستی بەسەر تاج و تەختدا گرت. دوای فیلوس، واکیوس دوو ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و شوێن مەسیحیەکان کەوت و لەبەر ئەمە هاورێیانی ئەشکەوت لەدەست ئەو رایان کرد و بۆ ئەشکەوتێك لەکوێستانێك لەرۆژهەڵاتی شاری ئەفسیس پەنایان برد. ئەم شارە دواتر وێران بوو. ئەوان سەد و پەنجا ساڵ لەو ئەشکەوتەدا مانەوە.

ئەم وتانە ناراستە چوونکە لەسەر ئەم بنەمایە لەکاتی بەرزبوونەوەی مەسیح تا ئەم زەمانە دەگاتە نزیکەی ٢١٥ ساڵ لەگەڵ ئەوەی بەوتەی ئاشکرای قورئان، هاورێیانی ئەشکەوت سێسەد و نۆ ساڵ لەئەشکەوتدا مانەوە (کهف/١٨/٢٥)و ئەمە دەبێتە ٥٢٤ ساڵ و بەمشێوە دەرکەوتنی ئەوان دەگاتە نزیکەی شەست ساڵ پێش ئیسلام. ئێمە ئاماژەمان بەوەدا لە دەرکەوتنی ئەوان تا کۆچی پێغەمبەر(د.خ) زیاتر لە دووسەد ساڵە وئەمە لەسەریەك زیاتر لەرۆژگاری نێوان مەسیح و پێغەمبەری ئیسلامە. بەڵام بێژەری ئەم قسانە دەڵێت شاراوە بوونی هاورێیانی ئەشکەوت وەك ئاماژەی پێدرا سەد و پەنجا ساڵە و ئەمە لەگەڵ وتەی قورئان بەئاشکرا یەك ناگرێتەوە. ئەگەر وتەی قورئان نەدەبوو، قسەکەی ئەو راست دەردەچوو.

پاشاکانیتر بریتی بوون لە: گالیوس ٢ ساڵ کە ئەو لەپاشایەتی هاوبەشی یولیانوس بوو و ١٥ ساڵ پاشایەتی کرد، کلۆدیوس، دواتر کورەکەی ئورلیانوس ٦ ساڵ، تافستوس و براکەی فورس ٩ مانگ، بروبس ٩ ساڵ، کاروس ٢ ساڵ و پێنج مانگ، دکلتیانوس ١٧ ساڵ و مەکسیمانوس لەگەڵ هاوبەشەکەی مەکسنتیوس کە لەسەر فەرمانرەوایەتی شەڕی یەکیان کرد و باوك فەرمانرەوایەتی شام و سەرزەمینی جزیرە و بەشێك لەرۆمی کرد و کوڕ فەرمانرەوایەتی رۆمیە و سەرزەمینە پەیوەستەکانی لەوڵاتی فەرەنگ کرد و ئەم دووانە ٩ ساڵ فەرمانرەوایەتیان کرد. لەگەڵ ئەوان قستنس باوکی کونستانتین بوو کەبەسەر سەرزەمینەکانی بوورنتیا (بووزنتیا: بیزانس) و پەیوەستەکانی، یانی شوێنی کونستانتین نوپێل کەهێشتا دروست نەکرابوو، فەرمانرەوایەتی کرد و دواتر مرد و دوای خۆی کورەکەی کونستانتین ناسراو بەناوی دایکی (هیلانە)هلێن فەرمانرەوایەتی کرد و ئەو بوو باوەری بەئایینی مەسیحی هێنا.

دەڵێن: لەسەرەتای کاری پاشاکانی رۆم تا ئەم زەمانە، فەرمانرەوایەتی ئەوان هاوشێوەی پاشایەتی تیرەکان بوو و لەبەر ئەمە ژمارەیان بەتەواوی و راستی نەنوسراوە و خەڵك لەبارەی ئەوان بەجیاوازییەوە قسەیان کردووە بەهەمان شێوە کە لەبارەی پاشاکانی تیرەکان بەجیاوازی قسەیان کردووە. ئەوی بتوانین پشتی پێببەستین، لەکونستانیتن تا هێرقلە کە محەمەد لەرۆژگاری ئەو بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردرا. بێژەری ئەم قسە راستی کرد چوونکە لەم بووارەدا بەرادەیەك ناسازگاری و جۆراوجۆری هەیە کەهەندێکیمان لەکاتی ئاماژەدان بەدسیوس(دکیوس) و هاورێیانی ئەشکەوت باس کرد. لەبەر ئەمەیە تەبەری باسی ئەوەی نەکردووە هاورێیان ئەشکەوت لەسەردەمی کام پاشایەدا بوون. ئێمە بۆیە ئاماژەمان پێدا تا روداوەکانی سەردەمی پاشایەتیمان باس کردبێت.

## چینی دووەم
## پاشا باوەرهێنەرەکان بەئایینی مەسیحی رۆم

دواتر کونستانتین لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و ئەو کەسەیە لەرێگەی هیلانەی دایکیەوە لەهەموو سەرزەمینەکانی رۆم ناسراوە. لەنێوان ئەو و مەکسیمیانوس و کورەکەی شەڕی زۆر رویدا. کاتێك ئەم دووانە مردن ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و بەتەنیایی فەرمانرەوایەتی کرد و رۆژگاری پاشایەتی گەشتە ٣٣ساڵ و چەند مانگ. لەناو پاشاکانی رۆم، ئەو بوو باوەری بەئایینی مەسیحی هێنا و شەڕی کرد تا خەڵك باوەڕیان پێهێنا و دەستبەرداری ئایینە کۆنەکەیان بوون و تا ئەمرۆ ئەو ئایینەیان هەیە.

لەبارەی هۆکاری باوەڕهێنانی بەجیاوازی قسەیان کردووە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو شێوەیەك پیسی بوو و دەیانویست لەناوی ببەن. یەکێك لەوەزیرەکانی کەباوەری بەمەسیحیەت هێنابوو و دایدەشارد، ئەوی بۆلای عیسا مەسیح رێنوێنی کرد تا چاکی بکاتەوە و پێشنیاری دانانی ئایینێکی پێکرد تا لەرێگەیدا شەڕ بکات. دواتر ئایینی مەسیحی لەبەرچاوی ئەودا شیرین کرد. ئەمکارەی کرد و مەسیحیەکانی رۆم لەکەسە نزیکە و تایبەتەکانی لایەنگریان لێکرد و ئەو هاوکاری لەوان وەگرت و بەیارمەتی ئەوان نەیارانی خۆی لەناوبرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو بەناوی بتەکانی چەندین سوپایان نارد کەهەموویان شکەستیان خوارد. ئەوان حەوت بت بەناوی حەوت ئەستێرە یانی لەسەر شێوەی سائبیەکان بوو. لەمکاتەدا یەکێك لەوەزیرەکانی کەشوێنکەوتەی ئاینی مەسیحی بوو و دەیشاردەوە، لەمبارەوە قسەی لەگەڵدا کرد و بتەکانی بەسوك و بێ بەها لەقەڵەمدا و پێشنیاری ئایینی مەسیحی پێکرد کە وەڵامی دایەوە و لەشەڕدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و پاشایەتییەکەی درێژەی کێشا. لەمبارەوە ئاماژەیان بەگێرانەوەیتریش داوە.

ئەو بوو شاری کونستانتین نۆپڵی لەسێیەم ساڵی پاشایەتی لەو شوێنەی ئێستای دروست کرد. بۆیە ئەوێی هەڵبژارد چوونکە بەهێزە و دوژمن بەئاسانی ناتوانێت

دستی بەسەردا بگرێت. ئەم شارە لەسەر کەنداوێکە کە لەدەریایی ڕەشەوە دەست پێدەکات و تا دەریایی ڕۆم(دەریایی سپی ناوەراست) درێژ دەبێتەوە. شار پەیوەست بەرۆمیە، سەرزەمینی فەرەنگیان و ئانەدۆلسە. ڕۆمیەکان بەئەستانبوول ناوی دەبەن کە بەمانای شاری پاشایە.

لەساڵی بیستەمەی پاشایەتی ئەو سەنهودسی یەکم لەشاری نیقە لەشارەکانی ڕۆم بەرپابوو. مانای ئەو کۆبوونەوەیە کە دوو هەزار و چوارسەد و هەشتا قەشەی تیا کۆبوویەوە. ئەو لەناو ئەوان سێسەد و هەژدە قەشەی هەڵبژارد کەیەك دڵ و یەك زمان بوون و ناسازگاریان پێکەوە نەبوو. ئەوان ئایینی ئاریۆس یان ئەسکەندەرانیان کەمەسیحیەکانی ئاریۆسی پەیوەستی بوون، بەلقێکی باوەرپێنەکراو لەقەڵەمدا و بەناردوایان زانی. ڕێسا و یاسا کە لەناو ئایینی مەسیحی لەئارادا نەبوو، لێرەوە بناغە بۆدارێژرا.

لەساڵی حەوتەمی پاشایەتی ئەو دایکی هیلانە ڕەهاوی بەرەو بیت المقدس کەوتە رێ. باوکی ئەوی لەرەها بەدیلی گرتبوو و ئەم کورە لەو کچە هاتە دنیا. هیلانە(هلن)بەرەو بیت المقدس کەوتە رێ و ئەودارەی مەسیحیەکان گومان دەکەن عیسایی پێ لەخاچ دراوە، هێنایەدەر و ئەو ڕۆژەی کردە جەژن و ئەمە هەمان جەژنی (چلیپایە). ئەو کەنیسەیەکی ناوداری بەناوی (قهامە) کە بەقیامەت یا ڕۆژی کۆتایی ناودەبرێت، دروست کرد. ئەم کەنیسەیە تا سەردەمی ئێمە ماوەتەوە و مەسیحیەکانی دنیا بۆ سەردانی دەچن. دەستەیەك دەڵێن: ڕۆشتنی ئەو بۆ بیت المقدس دوای ئەوە بوو چوونکە بەوتەی هەندێ کەس، کوڕەکەی لەبیستەمین ساڵی پاشایەتی باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا. ئەو لەبیست و یەکەمین ساڵی پاشایەتی خۆی هاورێ لەگەڵ دایکی هەموو ولاّتانی ژێردەستی خۆی لەکەنیسە داپۆشی. لەوانە کەنیسەی حمس و کەنیسەی ڕەها کە لەسەرسورهێنەرەکانی بیناسازییە.

دوای ئەو کورەکەی کونستانتینی دووەم بۆ ماوەی ٢٤ ساڵ فەرمانرەوایەتی ئەنتاکیەی کرد و ئەم فەرمانرەوایەتیەی لەباوکیەوە پێبڕا کە بۆی نوسی و کونستانتین ئوپڵی بەو سپارد و ئەنتاکیە و شام و میسر و جزیرەی بەبراکەی کستنس بەخشی و ڕۆمیە

و وڵاتە پەیوەستەکانی لەوڵاتی فەرەنگان و سەقلبیان (نۆسلاوەکان) بە براکەی کستوس سپارد و لەم دووانە پەیمانی وەرگرت گوێڕایەڵی براکەیان کۆنستانیتن بن.

دوای ئەو کوڕی براکەی یۆلیانوس بۆ ماوی دوو ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەو لەسەر ئایینی سائیبان بوو و دەیشاردەوە. کاتێك بەپاشەیەتی گەشت ئاشکرای کرد و کەنیسەکانی وێران کرد و مەسیحیەکانی کوشت. ئەو بوو بەرەو عێراق بەرێکەوت و ئەمە لەسەردەمی شاپور کوڕی ئەردەشێر بوو. یۆلیانوس بەتێرێك کەهاوێژەرەکەی دەرنەکەوت، کوژرا. باوکی جەعفەری تەبەری ڕوداوی ئەم پاشایەی لەرۆژگاری شاپور کوڕی ئەردەشێردا ئاماژە پێداوە کەدوای شاپور کوڕی ئەردەشێرە.

دوای ئەو یونیانوس هاتە سەر تەخت و ئایینی مەسیحی خۆی ئاشکرا کرد و وەك ئایینی خۆی ناساندی و بۆ عێراق گەڕایەوە.

دوای ئەو ولنتیوس ١٢ ساڵ و ٥مانگ، دواتر والێنس بۆ ٣ ساڵ و ٣ مانگ، والنتیسا بۆ ماوەی ٣ ساڵ فەرمانڕەوایەتیان کرد.

دواتر تدوسی گەورە (بەمانای بەخشراوی خوا) بۆ ١٩ ساڵ پاشایەتی کرد. لەپاشایەتی ئەو دووەمین سەنهودس (سۆرا) لەشاری کۆنستانتین ئوپێل بەسترا. لەم کۆبوونەوەدا ١٥٠ قەشە بەشداریان کرد و نفرینی مەقدونس و شوێنکەوتوانیان کرد. لەم کۆبوونەوەدا، بەتریقەکانی ئەسکەندەرییە، ئەنتاکیە، بیت المقدس و ئەو شارانەی بەتریقەکانی چوار بێت، کۆبوونەوە. ئەم چوار کورسیە بەمشێوەیە: یەکەم ڕۆمیە کەهی پترۆسی حەوارییە، دووەم ئەسکەندەرییە لەمرقس یەکێك لەنوسەرانی ئنجیلە چواردانەییەکان، سێیەم کۆنستانتین و چوارەم ئەنتاکیە کەئەویش هی پترۆسە. لەهەشتەمین ساڵی پاشایەتی ئەو هاوڕێیان ئەشکەوت دەرکەوتن.

دواتر ئەرکادیۆس کوڕی تدوس بۆ ماوەی ١٣ ساڵ و دواتر تدوسی بچوك کوڕی تدوسی

گەورە بۆ ماوەی ٤٢ ساڵ فەرمانرەوایەتیان کرد. لەبیست و یەکەمین ساڵی پاشایەتی ئەو سێیەم سەنهودسی لەشاری ئەفسس کرایەوە. لەم کۆبوونەوەدا دووسەد قەشە لەدەوری یەك کۆبوونەوە. هۆکاری ئەم کۆبوونەوە کارەکانی نەستورس بەتریقی کۆنستانتین ئوپێڵ (دامەزرێنەری مەسیحییە نەستورییەکان)بوو کە لەگەڵ ئایینی ئەوان یەکی نەدەگرتەوە. ئەم قەشانە نەفرینیان کرد و دەریان کرد. ئەو رۆشتە میسر و لەسەرزەمینی ئەخمیم مایەوە و لەدێهاتێك بەناوی سیسلّح (سیفلح)مرد. شوێنکەوتووانی زۆربوون و لەم ناوەدا لەنێوان ئەو و ئەیارانیان شەڕ کەوتەوە. دواتر وتاری ئەو لەناوچوو تا ئەوەی بەرسومامترانی کۆنی ئەسیبین ژیانی پێ بەخشییەوە. لەسەرسورهێنەرەکان ئەومیە محەمەد کوڕی عەبد الکریمی شەهرستانی نوسەری کتێبەکانی نهایە القدام و الملل و النحل (لەبارەی کیش و ئەندێشە کۆن و نوێکان) دەڵێت کەنەستورس لەسەردەمی مأمونی عەبباسی دەرکەوت. ئەم قسە تەنیا ئەو ئاماژەی پێداوە و گومان ناکەم کەس لەگەڵیدا هاورا بێت.

دوای ئەو مرسیان بۆ ماوەی شەش ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و لەیەکەم ساڵەکانی پاشایەتی ئەو چوارەمین سەنهودس (کۆبوونەوەی چوارەم) لەبەرابەر تسکرسی بەتریقی کۆنستانتین نۆپێڵ سازدرا و تیایدا سێسەد و سی قەشە بەشداریان کرد. لەم کۆبوونەوەدا یەعقوبیەکان لەمەسیحیەکانی تر جیابوونەوە.

دوای ئەو لیۆنی گەورە بۆ ماوەی ١٦ ساڵ، دواتر لیۆنی بچوك (هەڵگری ئایینی یەعقوبی ) یەك ساڵ و زنون ٧ ساڵ فەرمانرەوایەتیان کرد. زنون یەعقوبی بوو و پشتی لەپاشایەتی کرد وکورەکەی لەجێگەی خۆی دانیشاند. کوڕەکەی مرد و دووبارە هاتەوە سەر تەخت. ئەوسا نستاس بۆ ماوەی ٢٧ ساڵ پاشایەتی کرد. ئەویش یەعقوبی بوو. ئەو عەمورییەی دروست کرد. کاتێك بناغەکەی هەڵکەند، زێر و گەهەرو خواستراوی زۆری دەستکەوت کەخەرجی دروست کردنی ئەم بینایە لەوە درا و هێشتا لێی مایەوە کە کەنیسە و دێری پێ دروست کرد.

دوای ئەو یوستین هاتەسەر کار و ژمارەیەکی زۆری لەیەعقوبیەکان کوشت.

دوای ئەو یوستانوس ٢٩ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و لەرەها کەنیسەیەکی سەرسورهێنەری دروست کرد. لەرۆژگاری ئەو سەنهودسی پێنجەم لەکۆنستانتین سازدرا. قەشەکان لەم کۆبوونەوددا، ئەدریجا قەشەی مەنبجیان بەکافر لەقەڵەمدا لەبەر ئەوەی وتبووی دوای مردنی خەڵکان، بۆ سزادانی ئەوان گیانیان لەبەر ئاژەڵەکان دەکرێت و ئەمە سزایەکە خوا پێیان رەوا دەبینێت. لەرۆژگاری ئەو لەنێوان یەعقوبیەکان و مەلەکیان لەمیسر ئاژاوە دروست بوو. هەروەها لەسەردەمی ئەو جولەکەکان لەبیت المقدس و کوێستانی خەلیل لەبەرابەر مەسیحییەکان یاخی بوون و ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت. ئەم پاشایە کەنیسە و دێری زۆری دروست کرد.

بەدوای ئەودا یوستینوس بۆ ١٣ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. لەنێوان ئەو و ئەنەوشیروانی دادپەروەر چەندین نامە ئاڵو گۆر کرا و هەرکام بۆ ئەوی دیکە دیاری و پێشکەشی نارد. ئەو شەیدای بینا سازی و رازاندنەوە بوو.
ئەوسا موریس بوو بەپاشا. هەمان کەسە خوسرەو پەرویز لەکاتی شکان لەبەرابەر بەهرامی چوبینە پەنای بۆ برد و ئەو کچەکەی خۆی پێدا و پیاوانی شەرکەری لەگەڵدا نارد و ئەوی بۆ پاشایەتی گەڕاندەوە بەهەمان شێوە کە بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.
لەمکاتەدا فوکاس دەستی بەسەر تەختی پاشایەتی گرت و ئەو لەبەتریقەکانی موریس بوو. ئەو لەخاوەنەکەی خۆی یاخی وبەشێوەیەکی شاراوە کوشتی و دوای ئەو بوو بە فەرمانرەوایی رۆم. رۆژگاری پاشایەتی ئەو ٨ ساڵ و چوار مانگ درێژەی کێشا. کاتێك هاتە سەرتەخت، شوێن مناڵەکان و لایەنگرانی موریس کەوت و کوشتاری کردن. خوسرەو پەرویز ئەمەی بیست و تورە بوو، سوپایەکی زۆری بەرەو میسر و شام نارد و هەردووکیانی گرت. لەشکرەکەی ئەو مەسیحی زۆریان لەتیغی شمشێر تێپەراند. روداوەکە لەسەردەمی خوسرەو پەروێزدا دەگێرینەوە.

ئەوسا ئیمپراتۆر هێرقل لەسەر تەخت دانیشت. چۆنییەتی بوون بەپاشای ئەو بەمشێوەیە: کاتێك لەشکری ئێران هێرشیان کردە سەر رۆم و رۆمیەکان، درێژەیان بەرێگای خۆیاندا تا گەشتنە کەنداوی کۆنستانتین نۆپێڵ و گەمارۆیاندا. هێرقل لەم کاتەدا بۆ خەڵکی شار خواردن و ساز و بەرگی شەڕی لەرێگای دەریاوە دەهێنا. ئەم کارە بۆ رۆمیەکان شیاوی رێز بوو. ئازایەتی و جوامێری ئەو دەرکەوت و رۆمیەکان دڵیان پێبەست. ئەوانی بۆ شۆرش دژی فوکاس هاندا و کارە قێزەونەکانی ئەوی نیشاندان. ئەوان دژی راپەرین و کوشتیان و هێرقلیان هێنایە سەر تەخت.

## چینی سێیەم پاشاکانی رۆم دوای کۆچ

یەکەم پاشای ئەوان هێرقل بوو کەئاماژدمان بەچۆنییەتی هاتنە سەرتەختی دا. رۆژگاری پاشایەتی ئەو ٢٥ ساڵ بوو. دەستەیەك دەڵێن: ٣١ ساڵ بوو. پێغەمبەری ئیسلام لەرۆژگاری ئەودا بوو.
دوای ئەو کورەکەی خۆی کۆنستانتین هاتە سەرتەخت. دەستەیەك دەڵێن: ئەو کوری برای کۆنستانتین بوو. ئەو ٩ ساڵ و ٦ مانگ فەرمانرەوایەتی کرد. بەسەرهاتی ئەو لەکاتی ئاماژەدان بەشەڕکەرانی دەریا پێو بەخواستی خوا دەگێڕینەوە.
لەرۆژگاری ئەو شەشەمین کۆبوونەوە سازدرا و پیاوێك بەناوی کورس ئەسکەندەری نفرین کرد. ئەو لەگەڵ مەلەکییەکان ناسازگار و لەگەڵ مارۆنییەکان یەکیان گرتبوو.

ئەوسا کورەکەی کوستاخمس بۆ ماوەی ١٥ ساڵ هاتە سەرتەخت و ئەو هاورۆژگاری علی(ع) و معاویە بوو. دواتر هێرقلی بچوك کوری کۆنستانتین بۆ ماوەی ٤ ساڵ و سێ مانگ فەرمانرەوایەتی کرد. دواتر کۆنستانتین کوڕی کستا بۆ ماوەی ١٣ ساڵ لەبەشێك لەرۆژگاری معاویە و دواتر کورەکەی یەزید کوڕی معاویە، معاویە کوڕی یەزید، مەروان کوڕی حەکەم و دەسپێکی کاری عەبدولەلیك کوڕی مەروان، ئەستیان ناسراو بە((لوت شکاو)) ٩ ساڵ لەرۆژگاری عەبد الملەك کوڕی مەروان.
رۆمیەکان ئەویان لەسەر تەخت هێنایە خوار و لوتیان شکاند و بۆ دوورگەیەکی دوورخراوە دوریان خستەوە. ئەو رایکرد و پەیوەستی پاشای خەزر بوو و داوای هاوکاری لێکرد بەلأم دەستی نەکەوت و لەبەر ئەمە روی کردە شای بەرجان. دوای ئەو لونتس سێ ساڵ ل رۆژگاری عەبدولەلیك کوڕی مەروان پاشایەتی کرد و دواتر بوو بە لەخواترس و خۆپارێز و پشتی کردە پاشایەتی. دواتر ئەبسمیر ناسراو بەناوی تەرسوسی ٧ ساڵ پاشایەتی کرد. ئەستیان هاورێ لەگەڵ بەرجان شەڕی لەگەڵ ئەودا دەست پێکرد و لەنێوان ئەواندا شەڕی زۆر رویدا کەئەستیان تیایدا سەرکەوت و گەرایەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی. ئەمە لەرۆژگاری وەلید کوڕی عەبدولەلیکدا بوو. ئەستیان بەبەهێزی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. ئەو پەیمانی بەشای بەرجان دابوو سالأنە باژی بۆ بنێرێت. ئەو رۆمیەکانی خستە ژێر قامچی ستەمەوە و

ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. رۆمیەکان کۆبوونەوە و ئەویان کوشت. دووەمین رۆژگاری پاشایەتی ئەو دوو ساڵ و نیو درێژەی کێشا. کوژرانی ئەو لەسەرەتای دەسپێکردنی کاری سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك بوو. دوای ئەو نستاس کوڕی فیلفوس بەپاشایەتی گەشت. لەرۆژگاری ئەو جیاوازی کەوتە ناو رۆمیەکان و لەبەر ئەمە ئەویان لەسەر تەخت داگرت و دوریان خستەوە.

دواتر تیدوس ناسراو بەناوی (ئەرمەنی) هاتە سەرتەخت و ئەویش هاورۆژگاری سلێمان بوو. دوای ئەو ئەلیۆن کوری کۆنستانتین (بەهۆی ناتەوانی ئەو لەبەرێوبردنی وڵات) هاتە سەرتەخت و پەیمانی لەگەڵ رۆمیەکان بەست موسوڵمانەکان لەکۆنستانتین ئۆپێڵ دوور بکاتەوە. ئەوان کردیان بەپاشا. رۆژگاری پاشایەتی ئەو ١٦ ساڵی خایاند. ئەو لەو ساڵەدا مرد کەخەڵك بەیعەتیان لەگەڵ وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك دا بەست.

دوای ئەو کورەکەی کۆنستانتین بۆ ماوەی ١١ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و لەرۆژگاری ئەو دەوڵەتی ئومەوی رووخا. ئەو لەبیست و یەکەمین ساڵی پاشایەتی مەنسوردا مرد.

دواتر کورەکەی ئەلیۆن ١٩ ساڵ و چوار مانگ لەپاشماوەی فەرمانرەوایەتی مەنسور پاشایەتی کرد و لەخەلافەتی مەهدیدا مرد. دوای ئەو رەینی ژنی ئەلیۆن کوڕی کۆنستانتین هاورێ لەگەڵ کورەکەی کۆنستانتین کوڕی ئەلیۆن فەرمانرەوایەتیان کرد. ئەو ژنە لەپاشماوەی رۆژگاری مەهدی و هادی و دەسپێکردنی خەلافەتی رەشید کاروباری بەرێوە دەبرد. کاتێك کورەکەی گەورە بوو، نێوان ئەو و رەشیدی دەشێوان و دایکی خوازیاری ئاشتی بوو. رەشید مەبەستی شەڕی کرد و لەنێوان ئەو دووانە شەڕ رویدا. ئەو شکەستی خواد و ئەوەندەی نەمابوو دیل بکرێت. دایکی ئەوی گرت و شیشی لەچاوی کرد و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەتەنیا پاشایەتی کرد و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ڕەشید مۆر کرد.

دوای ئەو نەقفوز بوو بەپاشا و پاشایەتی لەو ژنە وەرگرتەوە و بۆماوەی ٧ ساڵ و سێ مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەو نەقفوز باوکی ئەستبراك بوو.
نەقفوز کورەکەی خۆی ئەستبراکی دوای خۆی کردە پاشا و یەکەم کەس لەرۆمیەکان بوو ئەم کاردی کرد. ئەم شێوە پێش ئەو ناسراو نەبوو. پاشاکانی رۆم پێش نەقفوز ریشی خۆیان دەتاشی و پاشاکانی ئێرانیش ئەم کارەیان دەکرد بەلاّم نەقفوز نەیکرد. پاشاکانی رۆم پێش ئەو لەسەرەتای نامەدا بەمشێوە دەیانووسی: لەفلاّن پاشای مەسیحیەکان. بەلاّم نەقفوز نوسی: لەفلاّن پاشای رۆم. ئەو دەیوت: من پاشا یا فەرمانرەوای هەموو مەسیحییەکان نیم. رۆمیەکان عەرەبەکانیان بەسارکیۆس(بەندەکانی سارە) ناودەبرد کەئاماژەیە بۆ بەهاجەر دایکی ئیسماعیل. نەقفوز ئەوانی لەم کارە دوور خستەوە. لەنێوان نەقفوز و بەرجان لەساڵی ١٩٣ کۆچی شەڕێك رویدا و لەو شەڕەدا کوژرا.

دوای ئەو لەسەر پێشنیاری ئەو، کورەکەی ئەستبراك بوو بەپاشا و دوو ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. دواتر میخاییل کوڕی جرجس کورە مامی نەقفوز هاتە سەرتەخت. هەندێ دەڵێن: ئەو کوری ئەسبراك بوو و دوو ساڵ لەخەلافەتی ئەمیندا فەرمانرەوایەتی کرد. دەستەیەك زیاتر لەمەیان وتووە. دواتر ئەلیۆن ناسراو بەناوی بەتریق دژی ئەو راپەڕی و بەسەریدا زاڵ و ئەوی خستە زیندانەوە. ئەلیۆنی بەتریق ٧ ساڵ و سێ مانگ فەرمانرەوایەتی کرد. یارانی میخاییل قۆلیان بۆ ئازاد کردنی گەورەی خۆیان هەڵماڵی و میخاییل بۆ پاشایەتی گەرایەوە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەرۆژگاری ئەلیۆن پارێزکاری کردە پیشە و رۆژگاری پاشایەتی لەم جارەدا نۆ ساڵ بوو. دەستەیەك دەڵێن زیاتر لەمە بوو.
دوای ئەو تۆفیل کوڕی میخاییل ١٤ ساڵ پاشایەتی کرد و هەمان کەسە زبتەرەی کردەوە و ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی موعتەسەمی عەبباسی مەبەستی شەڕ بکات و دەست بەسەر عەمورییەدا بگرێت. مەرگی ئەو لەرۆژگاری واسقی عەبباسیدا بوو.

دوای ئەو کورەکەی میخاییل ٢٨ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. کاروبارەکان دایکی هەڵیدەسوڕاند. ویستی دایکی بکوژێت بەڵام دایك پەنای بردە کەنیسە و پارێزکاری کردە پیشە. لەم کاتەدا پیاوێك لەخەڵکانی عەمورییە لەمناڵەکانی پاشاکانی کۆن بەناوی (کوری بۆفرات) دژی ڕاپەڕی. میخاییل بەو دیلانەی لەموسوڵمانەکان گرتبووی، ڕوبەڕوی بوویەوە و بەسەریدا سەرکەوت و کوشتی. دواتر بەسیلی سەقلەبی ناڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و بەسەر تاج و تەختدا زاڵ بوو و میخاییلی کوشت. ئەم ڕووداوە لەساڵی ٢٥٢ کۆچی ڕوویدا.

دواتر بەسیلی سەقلەبی بیست ساڵ لەڕۆژگاری مۆعتەز و مۆهتەدی و دەسپێکی خەلافەتی مۆعتەمید فەرمانڕەوایەتی کرد. دایکی سەقلەبی(ئۆسلاوی) بوو و ئەویان بەناوی ئەو بانگ دەکرد.

حەمزەی ئیسفەهانی لەبارەی ئەو ناراستی وتووە. ئەو لەکاتی ئاماژەدان بەمیخاییل دەڵێت: دوای ئەمە، پاشایەتی لەڕۆمیەکان گواسترایەوە بۆ سەقلەبیەکان و بەسیلی سەقلەبی بەگومانی ئەوەی باوکی سەقلەبی بووە، ئەوی کوشتووە.

دوای ئەو کورەکەی ئەلیۆن کوڕی بەسیل ٢٦ ساڵ لەڕۆژگاری مۆعتەمید و مۆعتەزید و دەسپێکی خەلافەتی موقتەدیری عەبباسی فەرمانڕەوایەتی کرد. دەستەیەك دەڵێن مردنی ئەو لەساڵی ٢٩٧ کۆچیدا بوو.

دواتر براکەی ئەلەکسەندروس یەك ساڵ و دوو مانگ لەدەبیلە پاشایەتی کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەویان بەهۆی کردەوە خراپەکانی بەشێوەیەکی شاراوە و کتوپڕ کوشت. دواتر کۆنستانتین کوڕی ئەلیۆن هاتە سەر تەخت. ئەو مناڵ بوو و کاروبارەکانی ئەو بەتریقی دەریا بەناوی ئەرمانوس بەڕێوەی دەبرد. ئەو چەندین مەرجی بۆ خۆی دانا. لەوانە ئەوەی کە: ئەو خوازیاری پاشایەتی نییە و خۆی و کورەکانی تاجی پاشایەتی لەسەر ناکەن. هێشتا دوو ساڵ تێنەپەڕیبوو کەئەو و

کورەکانیان بەپاشا ناوبرد و ئەو لەگەڵ کۆنستانتین لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. ئەو سێ منالی بوو. یەکیانی خەساند و کردییە بەتریق تا لەکێبڕکی بەدور بێت چوونکە بەتریق فەرمانرەوایەتی پاشای دەکرد. ئەو تا ساڵی ٣٣٠ کۆچی بەوشێوە مایەوە. دواتر دوو کورەکەی لەگەڵ کۆنستانتین یەکیان گرت تا باوکیان لەسەر تەخت لاببەن. ئەو دووانە گرتیان و بۆ کەنیسەیەك لەدوورگەیەك لەنزیك کۆنستانتین نۆپێڵ دوریان خستەوە. دوو کورەکەی ماوەی چل رۆژ لەدەوری کۆنستانتین مانەوە و ئاهەنگی کوشتنی ئەویان کرد. ئەو پێشیان کەوت و هەر دووکیانی گرت و بۆ دوو دوورگە لەدەریا دووری خستنەوە. یەکێك لەو دووانە پاسەوانەکەی خۆی کوشت بەلاَم خەڵکی دوورگە گرتیان و کوشتیان و سەرەکەیان بۆ کۆنستانتین نارد کە لەمەرگی ئەو زۆر خەمبار بوو و زۆر گریا.

بەلاَم ئەرمانوس چوار ساڵ دوای ئەوەی بوو بەپاشا مرد. پاشایەتی کۆنستانتین لەپاشماوەی رۆژگاری موقتەدیر و قاهیر و رازی و موستەکفی و بەشێك لەخەلافەتی موتیع درێژەی کێشا. دواتر کۆنستانتین کوڕی ئەندروکوس دژی ئەم کۆنستانتینە راپەڕی. باوکی لەساڵی ٢٩٤ کۆچی هاتەلای موکتەفی و لەسەردەستی ئەو باوەڕی بەئیسلام هێنا. کورەکەی لەرێگای ئەرمەنستان و ئازەربایجان بۆ رۆم رایکرد و خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە و شوێنکەوتووانی زیادی کرد. ئەو روی کردە کۆنستانتین نۆپێڵ و لەگەڵ پاشای کۆنستانتین لەسەر پاشایەتی شەڕی کرد. ئەمە لەساڵی ٣٠١ کۆچیدابوو. پاشا بەسەریدا زاڵ بوو و ئەوی کوشت.

فەرمانرەوای رۆمییە دژی راپەڕی. ئەم شارە پایتەختی پاشای فەرەنگ بوو. فەرمانرەوای رۆمیەی ناوی پاشای لەخۆی نا و جلّ و بەرگی پاشاکانی لەبەر کرد. فەرمانرەواکانی رۆمیە پێش ئەمە لەپاشاکانی رۆم و پاشاکانی کۆنستانتین فەرمانیان دەبرد و لەوان دەستوریان وەردەگرت. کاتێك ساڵی ٣٤٠ کۆچی گەشت، پاشای رۆمیە بەهێز بوو و گوێرایەڵی فەرمانەکانی ئەوی نەدەکرد. کۆنستانتین سوپای بۆ شەڕی ئەو و فەرەنگییەکانی هاورێی نارد. دوو سوپا روبەروی یەك بوونەوە و شەڕ دەستی پێکرد. رۆمیەکان شکەستیان خوارد و سەرکوت کران و بۆ کۆنستانتین نۆپێل گەڕانەوە. لەم کاتەدا کۆنستانتین دەستی لەناسازگاری هەڵگرت و خزمایەتی لەگەڵ

ئەواندا دروست کرد چوونکە کچی پاشای رۆمیەی بۆ کورەکەی خۆی هەڵبژارد. فەرنگەکان دوای ئەمە رۆژ لەدوای رۆژ بەهێزتر دەبوون و پانتایی فەرمانرەوایەتییەکەیان فراوان دەبوو بەشێوەیەك ئەوان بەسەر بەشێك لەئاندۆلس زاڵ بوون.( دواتر ئاماژەی پێدەدەین). هەروەها ئەوان دوورگەی سەقەلیە ((سیسیل)) و سەرزەمینەکانی فەراغ شام و بیت المقدسیان بەوشێوەی دواتر ئاماژەی پێدەدەین، داگیر کرد. و سەرئەنجام ئەوان لەساڵی ٦٠١ کۆنستانتین نۆپێڵیان داگیر کرد و بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

لەو روداوانەی شیاوی پەیوەست بوون بەم روداوانەیە، ئەوەیە تورکەکان پێکەوە ئامادەیان کرد ( لەوان بجناك و بەختی و جگە لەم دووانە بوون). مەبەستی شارێکی رۆمی بەناوی (ولیدەر)یان کرد و ئەمە لەساڵی ٣٢٢ کۆچی بوو. ئەوان گەمارۆی ئەو شارەیان دا و ئەم رووداوە بەگوێی ئەرمانوس گەشت. ئەو سوپایەکی گەورەی بۆ شەڕی ئەوان نارد کەدوانزە هەزار شەڕکەری مەسیحی لەناویاندا دەبینرا. شەڕێکی قورس رویدا و مەسیحییەکان شکەستیان خوارد و تورکەکان بەسەر شاردا زاڵ بوون و وێرانیان کرد و زۆر لەخەڵکەکەیان کوشت و بەدیلیان گرت و تالآنی زۆریان کۆکردەوە. دواتر رویان کردە کۆنستانتین نۆپێڵ و بۆ ماوەی چل رۆژ گەمارۆیاندا و هێرشیان کردە سەر وڵاتەکانی رۆم و تورکتازی ئەوان تا ناو قووڵایی سەرزەمینی فەرمنگەکان درێژەی کێشا و دواتر گەڕانەوە.

## داستانی گەشتنی هۆزە عەرەبیەکان بۆ عێراق و نیشتەجێ بوونی ئەوان لە حیرە

کوڕی کەلبی دەڵێت: کاتێك بخت النسر مرد، ئەو عەرەبانەی ئەو لەحیرە نیشتەجێی کردبوون، پەیوەستی خەڵکی ئەنبار بوون و حیرە بۆ رۆژگارێکی دوور و درێژ بەوێرانی مایەوە و خەڵکەکەی لەئەنبار ژیانیان بەسەر دەبرد و هیچ کەس لەرابردووەکان و داهاتووان لەعەرەب روی نەدەکردە حیرە. کاتێك منداڵەکانی مەعد کوڕی عەدنان و هاورێکانیان لەهۆزە عەرەبیەکان زیادیان کرد و شەڕەکان ئەوانی لەیەك کرد، بۆ گەڕان بەدوای ئاوەدانییەکان لەولای یەمەن و بەرزاییەکانی شام هاتنە دەر و دەستەیەك لەوان بەرەو بەحرەین رۆشتن و لەوێ نیشتەجێ بوون. چەندین دەستە لە هۆزی(ئەزد) لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەوانەی لەتەهامەوە هاتن، ئەمانە بوون: مالك و عەمرۆ و کورەکانی فەهم کوڕی تەیم کوڕی ئەسەد کوڕی وەبرە کوڕی قوزاعە و مالك کوڕی زوهەیر کوڕی عەمرۆ کوڕی فەهم لەگەڵ چەندین دەستە لەخەڵکەکانیان. غەتەفان کوڕی عەمرۆ کوڕی عوز کوڕی مەنات کوڕی یەقدەم کوڕی ئەفسا کوڕی دەعمی کوڕی ئەیاد کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان و کەسانێتر لەئەیاد پەیوستیان بوون. لەمکاتەدا چەندین هۆز لەعەرەب لەبەحرەین کۆبوونەوە و بۆ نیشتەجێ بوون لەوێ هاورابوون و پەیمانی هاوکاری و هاویاریان بەست و بوونە دەستەیەکی یەکگرتو و ناوی (تنوخ) (مانەوە) ئەوانی کۆکردەوە.

مالك کوڕی زوهەیر، جەزیمە ئەبرەش کوڕی مالك کوڕی فەهم کوڕی غانم کوڕی دوس ئەزدییان بۆمانەوە لای خۆیان بانگێشت کرد و خوشکەکەی لمیسی کردە هاوسەری ئەو. کۆبوونەوەی ئەوان لەسەردەمی پاشای تیرەکان بوو. لەبەر ئەوە پێیان دەوت پاشای تیرەکان چوونکە هەرکام پاشایەتی تیرەیەکی (تایەفەیەکی) بچوکیان لەزەمین دەکرد.

دەڵێت: دواتر گیانە نیشتەجێ بووەکانی بەحرەین بەرەو ئاوەدانی و دێهاتەکانی عێراق کشان و ئەوان تەماحیان پەیا کرد بەسەر ئێرانی دراوسێی خۆیان

لەسەرزەمینە عەرەبیەکانەوە زاڵ بن چوونکە لەم کاتەدا لەنێوان پاشای تیرەکان ناسازگاری فەرمانڕوایەتی دەکرد. ئەوان هاوڕا بوون بەرەو عێراق بەرێکەون. یەکەم کەس لەوان کەهاتەدەر و بەرێکەوت، حیقاد کوڕی حنق بوو کەدەستەیەك لەخەڵکەکەی بەتێکەڵەی جۆراوجۆر لەرەگەزە جیاوازەکان هاورێیەتیان دەکرد. ئەوان لەعێراق روبەڕوی ئەرمەنییەکان بوونەوە کەپاشاکانی سەرزەمینی بابل و سەرزەمینەکانی دراوسێ تا پانتاییەکانی موسڵ بوون و لەگەڵ ئەردەوانییەکان یانی پاشای تیرەکان کێشە و ناژاوەیان بوو. مەبەست لێی لەنێوان دێی نێفەر لەسوادی عێراق تا نۆبۆلەیە. ئەوانیان لەوڵاتەکەیان دوور کردەوە. ئەرمەنییەکان پاشماوەکانی ئەرمن و لەبەر ئەمە بەم ناوە ناودەبرێن. ئەوان هەمان نبتیەکانی سوادن.

دواتر مالك و عەمرۆ و دوو کورەکەی فەهم کوڕی تەیم الله و کەسانێتر لەتنوخەوە بەرەو ئەنبار بەرێکەوتن و فەرمانرەوایی سەرزەمینی ئەرمەنییەکانیان گرتە دەست. ئەوان فەرمانیان لەعەجەمەکان نەدەبرد. بەمشێوە بوو تا توبەع هات و ئەو هەمان باوکی کرب کوڕی ملکیکربە کە لەگەڵ سوپاکەی خۆی هات و ئەو کەسانەی لەسوپاکەی کە توانای شەڕکردنیان نەبوو، لەوێ بەجێهێشت. توبەع بەرێکەوت و دواتر بۆلایان گەرایەوە و ئەوانەی لەو شوێنەدا نیشتەجێ و خۆی بۆ یەمەن گەرایەوە. لەناو سوپاکەی ئەو شەڕکەران لەهەموو هۆزەکان دەبینران. تنوخیەکان لەئەنبارەوە بەرەو حیرە هاتن و لەخێوتە پەشمیەکاندا نیشتەجێ بوون و لە رۆشتنە ناو ماڵە گڵیەکان خۆیان بەدوور گرت. یەکەم کەس لەوان پاشایەتی گرتەدەست، مالك کوڕی فەهم وشوێنی مانەوەی لەدرواسێیەتی ئەنبار بوو. مالك دوای ماوەیەك مرد و بەدوای ئەو براکەی عەمرۆ کوڕی فەهم کوڕی غانم کوڕی دوسی ئەزدی بەپاشایەتی گەشت و کاتێك ئەو مرد، جەزیمە ئەبرەش کوڕی مالك کوڕی فەهم هاتەسەر تەخت. دەستەیەك دەڵێن: جەزیمە لەیەکەم عادیەیکان لەمناڵەکانی دمار کوڕی ئەمیم کوڕی لوز کوڕی سام کوڕی نوحە. و خوا زاناترە.

## بەسەرهاتی جەزیمە ئەبرەش

دەڵێت: جەزیمە یەکێك لەدوور ئەندێش ترین و سەختگیرترین پاشاکانی عەرەبی بوو کەکاتێك سزای دەدا، بەرامبەرە ستەملێکراوەکەی خۆی چارەرەش دەکرد. یەکەم کەس بوو پاشایەتی بۆی لەسەرزەمینی عێراقدا سەقامگیر و بەهێز بوو و عەربەکان پەیوەستی بوون. لەگەڵ پیاوە شەڕکەرەکانی خۆی چەندین شەڕی تۆمار کرد. ئەو پیسی هەبوو و لەبەر ئەمە عەرەبەکان بەتانەوە قسەیان لەبارەوە دەکرد وبەناوی وەك (درەوشاوە) و (سپی) بانگیان دەکرد وئەمە بۆ رێزدانان و گەورە کردنی ئەو بوو. شوێنی مانەوەی ئەو و کەسەکانی لەم شوێنانە بوو: لەنێوان ئەنبار و بەقە و حیرە و هیت و عین التمر و قەراغەکانی وشکی تا عومەیر و خەفیە.
باجەکان بۆ درگای ئەو دەنێردران و میوانەکان و دەستەکانی نوێنەرایەتی روویان لەو دەکرد. ئەو لەگەڵ تسم و جدیس لەشوێنی مانەوەیان لەیەمامە شەڕی کرد و حسان کوڕی توبەع کوڕی ئەکربی تێکشکاند. چوونکە هێرشی کردە سەریان و تاڵانی کردن. بەدوای ئەوە، حسان لەگەڵ دەستەیەك لەپیاوە شەڕکەرەکانی جەزیمە کەبۆ شەڕ بەرێکەوتبوون، روبەروو بوویەوە و ئەوانی تێکشکاند. جەزیمە دو بتی بوو کە پێیان دەوت(زیزنان: دوهاونێو). ئەیاد لەشوێنێك بەناوی عین نوباغ دەژیا. لای جەزیمە باسی کوڕێك لەلەخمیان کرد کە لەنێوان خاڵۆکانی خۆی لەئەیاد دەژیا و پێیان دەوت عودەی کوڕی ئەسر. ئەو گەنجێکی جوان و خۆش ئەخلاق بوو. جەزیمە دڵی پێبەست و پیاوە شەڕکەرەکانی بۆ شەر نارد. لەولا، ئەیادییەکان کەسیان نارد و دوو بتەکەیان دزی و بردیانەوە بۆ شوێنی مانەوەی خۆیان. ئەیادییان پەیك و پەیامیان بۆ نارد: دوو بتەکەی تۆ و دوو خواکەی تۆ لەناو ئێمەدان، پشتیان کردۆتە تۆ و روویان کردۆتە ئێمە. ئەگەر بەڵێن دەدەیت هێرشمان سەرنەکەیت و ئازارمان نەدەیت، بتەکان دەگەڕێنینەوە و گەرنە دەمێننەوە. ئەو پەیامی نارد: لەگەڵ دوو بتەکە ئەو گەنجەیش بنێرن. ئەوان وەڵامیان دایەوە و دوو بتەکەیان لەگەڵ گەنجەکەدا نارد کەجەزیمە لای خۆی داینیشاند و کردییە پەردەداری خۆی. ئەو شەرابی بۆ تێدەکرد.

دوای ماوەیەك، رەقاش خوشكی جەزیمە چاوی بەو گەنجە كەوت و علشقی بوو. كچ بۆ كور پەیامی نارد و تكای كرد لەبراكەی خوازبێنی بكات. كور وتی: بوێری ئەم كارەم نییە و نارەزوومەندی نیم. كچ پەیامی نارد: كاتێك لەكۆردا دادەنیشێت و روودەكاتە خواردنەوە، عەرەقێكی تایبەتی دەرخواردبدە. كاتێك مەی كاریگەری دانا، داوای منی لێبكە كەوەلامی نا ناداتەوە. كاتێك منی كردە هاوسەری تۆ، خەڵك بەشایەت بگرە.

عودەی ئەم كارەی كرد. جەزیمە وەلامی دایەوە و كچەكەی پێدا. هاتە ماڵی كچەكە و هەمان شەو كاری تەواو كرد و بەرەبەیان بەرەنگ و بۆنی خۆش لەخەو هەستا. جەزیمە ئەمەی بینی و بەدڵی نەبوو، وتی: ئەی عودەی، ئەم رەنگ و بۆنە چییە؟ عودەی وتی: رەنگ و بۆنی زاوایەتی. وتی: كام زاوایەتییە؟ وتی: زاوایەتی من لەگەڵ خوشكەكەت رەقاشە. وتی: هاوار لەتۆ! كێ ئەوی دابەتۆ؟ وتی: پاشا. جەزیمە لەم كارەی پەشیمان بوویەوە و داخی خوارد و بیرمەندانە سەری خستە سەر زەوی. عودەی ترسا و رایكرد و هیچ ناو و نیشانێك لەو نەبینرا. جەزیمە ئەم دو دێرە شێعرەی بۆ خوشكەكەی نارد:

| | |
|---|---|
| **خبريني و انت لا تكذبيني** | **ا بحر زنيت ام بهجين** |
| **ام بعبّد فانت اهل لعبّد** | **ام بدون فانت اهل لدون** |

واتاكەی: ئاگادارم بكەوە ئەی خوشكە چوونكە تۆ لەگەڵ من درۆ ناكەیت. ئایا بەسەربەرزییەوە زینات كردووە یا بەشەرمەزارییەوە؟ لەگەڵ بەندەیەكدا خەوتویت كەشیاوی بەندە بیت یا لەگڵ پەستێكدا خەوتویت كەشیاوی پەستەكان بیت.

كچ پەیامی نارد كەبەم شێوە نییە: تۆ خۆت منت بە وامێر نەژادێك لەعەرەبدا و منت لەكارەكەی خۆمدا سەربەست نەكرد یا پرست بەمن نەكرد. جەزیمە دەستی لەخوشكەكەی هەلگرت و لەتاوانەكەی خۆش بوو. عودەی گەرایەوە بۆ لای ئەیادییەكان و لەناو ئەواندا مایەوە. رۆژێك لەگەڵ چەند هاوتەمنێكی خۆی بۆ راو رۆشتە دەر كەیەكێك لەوان لەنێوان دو كێو تیرێكی بۆ هاویشت و كەوتە خوار و پەیكەری تێكشكا و دەستبەجێ مرد.

رەقاش دووگیان بوو، کوڕێکی هێنایە دنیا و ناوی نا عەمرۆ. کاتێك گەشتە تەمەنی مێرمندالی و بەهێز بوو، جل و بەرگێکی گرانبایی لەبەر کرد و رازاندییەوە و ناردی بۆ لای خالی. کاتێك جەزیمە بینی پەسەندی کرد و کردیە هاورێی کورەکانی.
جەزیمە ماوەیەك دوای ئەوە لەسالێکی پڕ باران و بەبەرهەم لەگەل کەس و کار و منالەکانی خۆی، بۆ گەڕان رۆشتە دەشت و هەموویان لەگولستانێکی سەرسەوز مانەوە. منالەکانی جەزیمە لەگەل عەمرۆ کوڕی عودەی رۆشتنەدەر تا کۆتربگرن. کاتێك سەماروغێکی باشیان دەگرت، دەیانخوارد و کاتێك عەمرۆ یەکی باشی دەگرت، دەیشاردەوە. ئەوان گەڕانەوە و لەراکردن پێش یەك دەکەوتن. عەمرۆ دەیوت:

هذا جناي و خياره فيه اذ كل جان يده في فيه

واتاکەی: ئەمە کۆکراوەی منە و باشترینەکانی تیایە و هەر هەلگرەوەیەك دەست بۆ دەمی خۆی دەبات.

جەزیمە ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و کردیە هاورێی خۆی و لەوتار و کرداری ئەو شادمان بوو. فەرمانی دا رازێنەرەوەی سیمینیان بۆ هێنا و گەردنبەندێکیان کردە ملی. یەکەم عەرەبێك بوو گەردنبەندی لەمل کرد.

رۆژگاری خۆش بوو کەلەناکاو پەرییەکان رفاندیان. جەزیمە بۆ ماویەکی زۆر لەهەر سوچ و قەراغێك بەدوایدا گەرا و هیچ ناو و نیشانێکی لێ بەدەست نەهێنا. دوای ماوەیەك دوو پیاو لەبەلقینی قوزاعە بەناوەکانی مالك و عەقیل کورەکانی فارج کوڕی مالك لەشامەوە هاتنە سەردانی جەزیمە و دیاری زۆر گرانباییان بۆ هێنا. لەگەلیاندا کەنیزێك بوو کەپێیان دەوت (دایکی عەمرۆ). ئەویان هێنا و نیشتەجێیان کرد. رۆژێك کەنیزەکە خواردنی هێنا. لەو کاتەی ئەوان دەیانخوارد لەناکاو گەنجێکی روت و قوت بە پرچی درێژ و نینۆکی درێژ روی تێکردن و لەسوچێکدا دانیشت. دەستی درێژ کرد و دوای خواردنی کرد. کەنیز گۆشتی مەڕی پێدا، خواردی و دوبارە دەستی درێژ کردەوە. ژن وتی: گۆیلە سەری پێمەدە چوونکە بەدوای بازوودا دەگەڕێت. ئەم قسە بۆ بەپەند و لەناو خەلکدا بلاو بوویەوە. ئەوسا ئەو ژنە مەی بەو دوو پیاوەدا و دەمی مەشکەکەی خۆی توند بەست. عەمرۆ کوڕی عودەی وتی:

صددت الكاس عنا ام عمرو | و كان الكاس مجراها اليمينا
وما شر الثلاثه ام عمرو | بصاحبك الذى لا تصحبينا

واتاکەی: ئەی دایکی عەمرۆ پیاڵەت لەنێمە دریغ کرد هەرچەندە بەلای راستدا دەسورا. ئەی دایکی عەمرۆ لەنێوان ئێمە سێ کەس، ئەو کەسەی پشت گوێت خست، نزمترین و پەسترین کەس نەبوو.

پرسیاری ناسنامەیان لێکرد و وتی: ئەگەر من نەناسن و نەژادی من نەزانن، من عەمرۆ کوڕی عودەی کوڕی تنوخیەی لەخمیم. بەیانی بمبینن کە کەس سەرپێچی فەرمانەکانم ناکات.

ئەو دووانە لەشوێنەکەیان هەستان و سەرو روخساریان شۆرد، جل و بەرگیان لەبەر کرد و وتیان: کەس بەرێزتر لەخوشکەزاکەی جەزیمە نابینین بۆ ئێمە دەستوری بارکردن وەربگرێت. ئەو دوانە هێنایانە لای جەزیمە کە لەبینینی شادمان بوو و وتی: رۆژێك کەرۆشت ئەوم بەگەردنبەندی سیمینەوە بینی. ئەو تا ئێستا لەچاو و دڵی من دوور نەکەوتبوویەوە. گەردبەندەکەیان بۆ هێنا و وتی: عەمرۆ لەوە گەورەتر بووە گەردن بەند لەمل بکات. ئەم قسەیشیان کردە پەند. جەزیمە بە مالك و عەقیلی وت: فەرمان بدەن.

وتیان: داوادەکەین بەردەوام تا ئێمە بین و تۆ بیت، هاونشینی تۆ بین. ئەوان بوونە هاونشینی جەزیمە و ئەم داستانە بوو بەپەند (کەخەڵکی عەرەب دەڵێن: ئەم و ئەو لەشێوەی هاونشینەکانی جەزیمەن).

پاشای عەرەب لەسەرزەمینی جزیرەو بەرزاییەکانی شام عەمرۆ کوڕی زەرب کوڕی حسان کوڕی ئوزینە عەلقەمی لەبەرێوبەرانی عەملاقان بوو. ئەو شەڕی لەگەڵ جەزیمە کرد و کوژرا، سوپاکەی بلاوەی لێکرد و جەزیمە تەندروست گەرایەوە. دوای عەمرۆ کچەکەی زەببا بەناوی نایلە بوو بەپاشا. سوپاکانی زەببا لەپاشماوەکای عەملاقان و ئەوان بوون. لەفوراتەوە تا تەدمور لەژێر دەستی ئەودا بوو. کاتێك پاشایەتیەکەی بەهێزبوو، سوپای کۆکردەوە و بۆ تۆڵە سەندنەوەی باوکی بۆ شەڕ

لەگەڵ جەزیمە بەرێکەوت. خوشکەکەی زەببە کەژنێکی فرەزان بوو پێی وت: ئەگەر بڕۆیتە شەر دەبێت بزانیت ڕۆژێك سەردەکەویت و ڕۆژێکیتر شکست دەخۆیت. ڕۆژێك لەگەڵ تۆیە و ڕۆژێك دژی تۆ. بەخوشکەکەی وت بیر لەنەندێشەی شەڕ نەکاتەوە و ڕێگای فێڵ بگرێتەبەر. زەببا وەڵامی دایەوە وپەندەکەی لەگوێ گرت. ئەو نامەی بۆ جەزیمە نوسی و بۆ خۆی و پاشایەتی کردن بەسەر خۆی بانگی کرد. نوسی: لەپاشایەتی ژنان جگە لەناوی قێزەون و فەرمانڕەوایەتی سست نابینیت و بۆ خۆی و پاشایەتییەکەی خۆی هاوتایەك باشتر لەو ناناسێت.

کاتێك نامەکەی بەجەزیمە گەشت، داواکارییەکەی بەسوك زانی و هاوڕێ باوەڕ پێکراوەکانی خۆی کۆکردەوە (ئەو لەبەقە لەقەراغەکانی فورات بوو). نامەکەی زەببای بۆ خوێندنەوە و راوێژی لەگەڵ کردن. ئەوان یەك دڵ و یەك زمان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی جەزیمە هێرشی بکاتەسەر و دەست بەسەر وڵاتەکەیدا بگرێت.

لەناو ئەواندا پیاوێك بوو پێیان دەوت قەسیر کوڕی سەعد. ئەو لەهۆزی لخم بوو. سەعد لەگەڵ کەنیزێکی جەزیمە ببووە هاوجێگا و ئەو قەسیری بۆ هێنایە دنیا. ئەو پیاوێکی فرەزان، دوورنەندێش، چاکەخوازی جەزیمە بوو. باوەڕی ئەو لەگەڵ ئەوان یەکی نەدەگرتەوە. ئەوان هۆکاریان پرسی و وتی: وتەیەکی سستە و فریوێکی ڕاست. ئەمەیش بوو بەپەند. بەجەزیمەی وت: نامەی بۆ بنووسە و بانگی بکە بۆ ئێرە کەئەگەر ڕاستگۆ بێت دێت و ئەگەر نا، دەستی ئەوت بۆ سەر خۆت درێژ نەکردووە کە ئەو داغدارە و باوکیت کوشتووە.

جەزیمە گوێی لەقسەکەی قەسیر نەگرت و وتی: تۆ پیاوێکی ئەندێشەت شاراوەیە، نە لەبەر روناکی هەتاو. ئەمەیش بووە پەندێك و بڵاو بوویەوە.

جەزیمە خوشکەزاکەی خۆی عەمرۆ کوڕی عودەی بانگ کرد و پرسیاری بۆچوونی ئەوی کرد. عەمرۆ بۆ ڕۆشتن هانی دا. پێی وت. نمارەکان لەکەسەکانی منن کە لەناو سوپای زەببابەدان. ئەگەر تۆ ببینن دەبنە هاوڕێی تۆ. جەزیمە قسەکەی پەسەند کرد.

قەسیر وتی: لە قەسیر فەرمان نابەن. عەرەبەکان وتیان: کار لەبەقە تەواو بوو. ئەم دوو وتەیش بوونە پەند.

جەزمیە عەمرۆ کوڕی عودەی بۆ جێگری خۆی هەڵبژارد. لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عەبدالجن کە فەرماندەی سوپاکەی بوو بەرێکەوت. ئەو هاورێ لەگەڵ گەورەکانی وڵاتەکەی بەرێکەوت و کاتێك گەشتە (فرضە)، لەقەسیری پرسی باوەری تۆ چییە؟ قەسیر وتی: بیروڕای ٥نت لەبەققە فرێدا. ئەم وتەیش بوو بەپەند.

نێردراوانی زەببا بەدیارییەکان بۆ پێشوازی هاتن. ئەو پرسی: ئەی قەسیر بارودۆخ چۆن دەبینی؟ وتی: خواستی عەقڵە و زیانی گەورە. ئەم وتەیش بوو بەپەند. قەسیر هەروەها وتی: هەر ئێستا سوارەکان چاویان بەتۆدەکەوێت، ئەگەر لەپێش تۆ بڕۆن ئەم ژنە ڕاستگۆیە و ئەگەر لەملاو لای تۆ بڕۆن و تۆ لەنێوانیاندا بیت، ئەم خەڵکە فێڵبازن. کەواتە بێدرەنگ سواری (عەسا) بە. ئەو ئەسپێکی بوو بەناوی عەسا کەبایش بەتۆزی پێی نەدەگەشت. ئەو بەجەزیمەی وت: من لەگەڵ تۆدا سوار دەبم و هەردووکتان ڕزگار دەکەم.

سوارەکان هاتن و ئەویان لەعەسا دوور کردەوە. قەسیر سواری بوو و بەرێکەوت: جەزیمە سەیری کرد و وتی: هاوار لەدایکی کەدوور ئەندێش و چالاك لەسەر عەسا دانیشتووە. ئەمەیش بوو بەپەند. قەسیر وتی: کەسێك سواری عەسا بێت گومڕا نابێت. ئەم وتەیش بووبەپەند. ئەسپ ئەوی تا ئاوابوونی خۆر بردە پێش و چوونکە ڕێگەیەکی درێژی بەغاردان پێوابوو، لەپێکەوت و دەستبەجێ گیانیدا. قەسیر بورجێکی بۆ دروست کرد کەناویان نا بورجی عەسا. عەرەبەکان وتیان: عەسا باشترینی هێناوە. ئەم وتەیش بوو بەپەند.

جەزیمە بەرێکەوت و سوارەکان ئەویان لەنێوان خۆیان گرت و هێنایانە لای زەببا. کاتێك جەزیمە ئەو ژنەی بینی، ژن خۆی ڕوت کردەوە و قونی پڕمووی خۆی نیشاندا. بەجەزیمەی وت: ئەی جەزیمە، ئایا میوانی زاوایەتی دەبینی؟ ئەم وتەیش بوو بەپەند. جەزیمە وتی: کارد بەئێسقان گەشت و زەوی وشك بوو و فێڵەکەتان ئاشکرا. ئەم وتەیش وەك پەند بڵاوبوویەوە. زەببا لەوەڵامدا وتی: سوێند بەپەروەردگارم، گوێزانم کەم نییە، بەڵکو شێوەیەکی تایبەتی دەستەیەك لەخەڵکە کە نیشانی تۆی دەدەم. ئەم وتەیش بووبەپەند. دواتر ئەو ژنە وتی: بیستومە خوێنی پاشاکان بۆ چاك کردنەوەی هاری دەبێت. دواتر ئەوی لەسەر پێستێکی پەشمین دانیشاند و

تەشتێکی زێرینی داواکرد. هێنایان. شەرابی دەرخواردا و کاتێك کاریگەری شەراب دەرکەوت، فەرمانیدا دوو دەمارەکەی ببڕن. ژن تەشتەکەی لێ نزیك کردەوە چوونکە پێیان وتبوو ئەگەر دڵۆپێك خوێنی برژێتە سەرزەوی تۆڵەی دەستێنن. بۆ رێز گرتن لەپاشاکان، لەملی ئەوان نادەن مەگەر ئەوەی لەشەڕدا ناچار بن. کاتێك دەستەکانی سست بوو، کەوت و دڵۆپێك لەخوێنی رژایە دەرەوەی تەشتەکە. ژن قیژاندی: خوێنی پاشا مەرێژن. جەزیمە وتی: خوێنرژاو کەسانی خۆی خوێنی دەرێژن. ئەم وتەیش بوو بەند.

جەزیمە لەناوچو و قەسیر لەوهۆزەی عەسا رۆشتبوویە خاکی ئەوان، هاتەدەر و رۆشتە لای عەمرۆ کوڕی عودەی. ئەو لەحیرە بوو. ئەوی بینی لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عەبدالجن ناسازگارە. ئەوانی ئاشت کردەوە و خەڵك لەعەمرۆ کوڕی عودەی فەرمانیان برد و قەسیر پێی وت: چالاك و ئامادە بە و خوێنی خاڵۆت لەبیر مەکە. عەمرۆ وتی: چۆن دەستم بەو ژنە بگات کە ماڵەکەی لەهێلانەی لاشخۆر بەرزترە. ئەمە وتەیش بوو بەپەند.

زەبیا لەبارەی خۆی و لەناوچوونی خۆی لەگەڵ کاهینان راوێژی دەکرد. پێیان وتبوو: لەناوچوونت لەسەر دەستی عەمرۆ کوڕی عودەیە بەڵام مردنت بەدەستی خۆت. ئەو لەعەمرۆ خۆی بەدوور گرت و لەشوێنی مانەوەی خۆی تونێلێکی بەرەو قەڵایەك کەلەشارستانەکەی خۆیدا بوو، لێدا و وتی: ئەگەر رووداوێکی کتاوپڕ روبدات، دەرۆمە ناو تونێلەکە و لەوێوە بۆ قەڵاکە دەرۆم. ئەو وێنەکێشێکی دەست رەنگینی بانگ کرد وبەنهێنی بۆ لای عەمرۆ کوڕی عودەی نارد و وتی: لەو بارودۆخانەدا وێنەیەم بۆبکێشە- بەدانیشتان، وەستان، بەجل و بەرگی خەو، بەجل و بەرگی شەڕ بەرەنگ و روخساری خۆی هەرکام بەهەمان شێوەی کەرازاوەتەوە. وێنەکێش ئەم کارەی کرد و گەرایەوە بۆ لای زەبیا. ئەو دەیویست عەمرۆ کوڕی عودەی باش بناسێت و بەهەر جۆرێك بیبینێت بیناسێتەوە.

قەسیر بەعەمرۆی وت: لوتم ببڕە و پشتم بەقامچی شین و مۆر بکەرەوە و بمنێرە بۆ لای ئەو ژنە. عەمرۆ کوڕی عودەی وتی: نایکەم. قەسیر وتی: من بەخۆم دەسپێریت و خۆت سەرکۆنە دەکەیت. ئەم وتەیش وەك پەند لەناو خەڵکدا بلآو بوویەوە. عەمرۆ وتی: تۆ زاناتری. ئەو لوتی قەسیری بڕی و پشتی شین و مۆر کردەوە. قەسیر هاتەدەر وەك بڵێی رایکردەووە و عەمرۆ ئەو کارەی لەگەڵ کردووە. هاتە لای زەببا. پێیان وت: قەسیر چاوەڕێ دەکات. فەرمانیدا مۆڵەتی پێ بدەن. بینی لوتی بڕاوە و پشتی شین و مۆر بۆتەوە. ژن وتی: تاوانێکی گەورەیە لوتی قەسریان بڕیوە (تاوانێکی گەورەیە قەسر لوتی خۆی بڕیوە). ئەم وتەیش بوو پەند. ژن وتی: ئەمەچ رۆژگارێکە تۆی تیا دەبینم؟ قەسر وتی: عەمرۆ گومان دەکات خیانەتم لەخاڵۆی کردووە و یگەی هاتنە لای تۆم بۆ تەخت و هانمداوە و تۆم دژی ئەو راپەراندوە. لەبەر ئەمە ئەم کارەی لەگەڵ من کردووە کەدەیبینی. هاتومەتە لای تۆ چوونکە دەزانم بوونم لای تۆ زیاتر لەهەر شتێك ئازاری ئەو دەدات. ژن رێزی لێگرت و قەسر کەمێك دوورنەندێشی و وشیاری و ئاگایی و لێهاتویی خۆی بەکار برد تا بووە هۆی نزیك کەوتنەوەی لەزەببا.

کاتێك قەسر زانی زەببا لێی نزیك بۆتەوە و باوەری پێکردووە، وتی: لەعێراق سامانی فراوانی زۆرم هەیە و لەوێ شتی گران و بۆنی خۆشی گرانبابییم هەیە. من بنێرە تا سامانەکەی خۆم بێنم و لەکالآ بازرگانییەکانی ئەوێ چەندین شت تۆ بگەیەنم. مندێ لەوشتانەی بۆ پاشاکان بەسوودە بۆ تۆ ئامادە بکەم. زەببا سامانی خستە بەردەست و کاروانێکی لەگەڵ نارد. ئەو هات و گەشتە عێراق و بەنهێنی رۆشتە لای عەمرۆ کوڕی عودەی و هەموو شتێکی بۆ باس کرد و وتی: قوماشی گرانبایی و کەم وێنە لەگەڵ مندا بنێرە کەخوا دەستی تۆ بەسەر زەببادا زاڵ دەکات و تۆڵەی خوێنی خۆت دەستێنیت و دوژمنەکەت دەکوژیت. ئەو نیازەکانی بەراوەرد کرد و بەرێی کرد. قەسیر بەو شتانە هاتە لای زەببا. زەببا شادمان و کالآکانی پەسەند کرد. دواتر سامانی زیاتری لەجاری یەکەم پێدا و بەرێی کرد. ئەو هاتە عێراق و پێویستی خۆی لەعەمرۆ کوڕی عودەی وەرگرت و هیچ کالآیەکی جوان و کەم وێنەی بەجێنەهێشت مەگەر ئەوەی یەکێکی لێهەڵگرت و هێنایە لای زەببا و پێشکەشی کرد. بۆ سێیەم جار

هاتە لای عەمرۆ کوڕی عودەی و وتی: ئەو کەسانەی لەهاورێیەتی وهاوکاری تۆبەهێز و بەوەفان، لەگەڵ سوپا لێهاتووەکەت بۆمن کۆبکەرەوە و جەواڵیان بۆ ئامادە بکە (ئەو یەکەم کەس بوو جەواڵی بەکار برد) هەر دوو پیاو لەجەواڵێك لەهەر دوو لای وشتر دابشارەوە و شوێنی گرێکان لەناوەوە دابنێ. دوبارە قەسیر بەعەمرۆ کوڕی عودەی وت: کاتێك دەڕۆمە شارەکەی زەببا، تۆ لەتونێلەکە بەجێدێڵم و پیاوە شەڕکەرەکان لەجەواڵەکان دێنەدەر و ئەوان لەشاردا جاردەدەن. هەرکەس شەردەکات لەگەڵ ئەواندا بیکات و ئەگەر زەببا ئاهەنگی تونێلەکەی خۆی کرد، تۆ بیکوژیت.

عەمرۆ ئەم کارەی کرد و هەموویان بەرێکەوتن. کاتێك لەزەببا نزیك بوونەوە، قەسیر رۆشتە پێش و موژدەی پێدا کە بڕێکی زۆر قوماشی کەم وێنە و گرانبایی بۆ هێناوە. داوای لێکرد بێتەدەر و سەیری وشترەکان و بارەکانیان بکات. قەسیر شەوانە دەخەوت و رۆژانە دەرۆشت. ئەو یەکەم کەس بوو ئەم کارەی دەکرد. زەببا هاتەدەر و وشترەکانی بینی بەوشێوەی وەك بڵێی قاچیان لەقوڵایی زەوی رۆدەچێت. زەببا وتی: ئەی قەسیر

| | |
|---|---|
| ما للجمال مشيها و ئيدا | اجندلا يحملن ام حديدا |
| ام صرفاناً باردا شديدا | ام الرجال جثما قعودا |

واتاکەی: وشترەکان چیان بەسەر دێت بەم قورسییە هەنگاو هەڵدەگرن؟ ئایا بەردیان پێیە یا ئاسن؟ یا سورب و مس دەهێنن یا پیاوی شەڕکەری ئامادە بۆ شەڕیان پێیە؟

وشترەکان هاتنە ناوشار وکاتێك گەشتنە ناوەراستی شار، لەزەویدا چۆکیان پێدادان و پیاوەکان لەناو جەواڵەکان دەرپەرین.

قەسیر دەروازەی تونێلەکەی بەعەمرۆ نیشاندا و پیاوانی شەڕکەریش بەسەر خەڵکی شاردا دەیانئەڕاند و شمشێریان خستە نێوانیان. عەمرۆ لەتونێلەکەدا دانیشت. زەببا هات و ویستی لەتونێلەکە بڕوات. کاتێك عەمرۆی لەدەروازەی تونێلەکەدا بینی، لەروی ئەو وێنەی نیگارکێش بۆی هێنابوو، ناسییەوە. شلەمەنییەکی ژەهراوی کە لەنگینی ئەنگوستیلەکەی هەڵیگرتبوو، هەڵمژی و وتی: خۆم بکوژم باشترە لەوەی لەدەست عەمرۆ شەرابی مەرگ وەربگرم. ئەمەیش بوو بەپەند. عەمرۆ بەشمشێر

لەسەریدا ونەوی لەناو خاکدا گەوزاند. ئەو رقی خۆی بەسەر شاردا خاڵی کردەوە( و کوشتار و تالآنی کرد) و بۆ عێراق گەرایەوە.

پاشایەتی دوای جەزیمە بەخوشکەزاکەی گەشت: عەمرۆ کوڕی عودەی کوڕی نەسر کوڕی رەبیعە کوڕی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی سعود کوڕی مالك کوڕی عەمرۆ کوڕی نمارە کوڕی لخم. ئەو لەیەکەم پاشاکانی عەرەب بوو حیرەی کردە شوێنی مانەوەی خۆی و پایەتەختی پاشاکان. تا کاتی مردنی پاشا بوو و سەد و بیست یا سەد و هەژدە ساڵ ژیا. لەم ناوەدا: لەسەردەمی پاشاکانی تیرەکان ٩٥ ساڵ، رۆژگاری ئەردەشیری کوڕی بابەك ١٤ ساڵ و رۆژگاری کورەکەی شاپور کوڕی ئەردەشیر ٨ ساڵ و دوو مانگ. ئەو بەتەنیایی فەرمانرەوایەتی دەکرد و ملکەچی پاشای تیرەکان نەدەبوو تا ئەردەشیر کوڕی بابەك لەخەڵکی ئێران لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. پاشایەتی لەبنەماڵەکەیدا مایەوە تا بەدوایین کەسیان نەعمان کوڕی مونەزەر گەشت و پاشاکانی تیرەکانی لێکەوتەوە. بە خواستی خوا دواتر ئاماژە بەمە دەدەین.
لەبارەی هۆکاری رۆشتنی مناڵەکانی نەسر کوڕی رەبیعە بۆ عێراق ئاماژەیان بەهۆکاریتریش داوە. باسی خەوێکە کەرەبیعە بینی و ئاماژە پێدانی لەکاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی حەبەشیەکان دێت.

## داستانی تسم و جەدیس کە لەرۆژگاری پاشای تیرەکان بوون

تسم کوڕی لوز کوڕی ئەزهەر کوڕی سام کوڕی نوح و جەدیس کوڕی عامر کوڕی ئەزهەر کوڕی سام کوڕی نوح ئامۆزای یەك بوون و لەیەمامە ژیانیان بەسەر دەبرد کەلەو ساتەدا ((جەو))یان پێدەوت و لە بەپیت ترین و سەرسەوزترین سەرزمینەکان بوو. پاشاکەیان لەسەردەمی پاشای تیرەکان عەملیق بوو. ئەو پیاوێکی ستەمکار و درندە و دێو کردار و ئەخلاق ناشیرین بوو. ژنێك لەجەدیس بەناوی هەزیلە پیاوەکەی بەرەلآی کرد و ویستی منالەکەی لێبستێنێتەوە. ژن داوەری بۆ لای عەملیق برد و وتی: ئەی پاشا، منالم نۆ مانگ لەسك هەلگرت و بۆ یەك سات لێی بێ ئاگا نەبووم و دوو سالّ بەشیر تێرم کرد. ئێستا کاتێك ئەندامەکانی پەیوەستی یەك بووە، دەیەوێت لەمنی وەربگرێتەوە بە زۆر و بەرەلآم بکات سەرگەردان. میرد وتی: مارەیەکەیم دا بەبۆل و خەروار، بەلآم چێژم لێنەبرد زۆر، ئەماج و ئەنئەم لاولا، بۆم بەبەر نەبوو مەگەر منالێکی ناساغ و بێ ناو، فەرمانی راست بدە، ئەگەر بەتوانایت بۆ کار. پاشا فەرمووی ئەو منالە پەیوەستی کۆیلەکانی ئەو بکەن و ژن و پیاو هەر دووکیان بفرۆشن. بەمێرد یەك لەسەر پێنجی بەهای ژن بدەن و بەژن یەك لەسەر دەی بەهای مێرد. هەزیلە ئەم شێعرانەی وت:

| | |
|---|---|
| اتینا اخاطسم لیحکم بیننا | فانفذ حکما فی هزیله ظالما |
| لعمری لقد حکمت لا متورعا | و لا کنت فیمن یبرم الجکم عالما |
| ندمت ولم اندم و انی بعترتی | و اصبح بعلی فی الحکومة نادما |

واتاکەی: هاتینە لای فەرمانرەوای تسم تا داوەری لەنێوانمان بکات. ئەو لەبارەی هەزیلە فەرمانێکی ستەمکارانەی دەرکرد. ئەی دلّ، پیاوێکی پارێزگارت نەکردە داوەر و ئەنجامدەری فەرمانت بەجوانی نەناسی. پەشیمان بوومەوە و پێشتر پەشیمانیم نەبوو. ئێستا خزم و کەس و کاری من لەکوێن؟ مێردەکەیشم لەم داوەرییە پەشیمان بوویەوە.

کاتێك عەملیق ئەمەی بیست، فەرمانیدا هەر کچێك کە لەجەدیس بەمێردی دەدەن

و دەیبەنە ماڵە مێرد، پێشتر بیهێننە ماڵی ئەو تا کچێنی هەڵبگرێت. خەڵك لەم کارە ئازار و ستەمی زۆریان چەشت. کار بەم شێوە دەسوڕا تا (شەموس) (شاژنی خۆر) یانی عەفیرە کچی ئەسوەد یان بەمێرددا و کاتێك ویستیان بیبەن بۆ ماڵی مێرد، ئەویان لەگەڵ کچەکانی هاوڕێی بۆ لای عەملیق برد تا چێژی لێببات. کاتێك کچەکە هاتە لای عەملیق، کچێنی هەڵگرت و بەجێی هێشت. کچ لەتاو ئازار شەرواڵەکەی لە پێش و دواوە دڕاند و هەر دوو لای خۆی دەرخست و ئەو خوێنەی لەسەر سمت و ران و شوێنەکانیتری بوو، ئاشکرای کرد. دیمەنێکی زۆر قێزەون دەرکەوت. ژن ئەم شێعرانەی دەوت و قوڕ قوڕ دەگریا:

لا احد اذل من جديس — اهكذا يصنع بالعروس

يرضى بذايا قوم بعل حر — اهدى و قد اعطى و سيق المهر

يقبضه الموت كذا كوريفسه — اصلح ان يصنع ذا بعرسه

واتاکەی: کەس پەستتر لەجەدیس نییە. ئایا لەگەڵ بووك ئەم کارە دەکەن؟ ئایا مێردێکی ئازادە بەم کارە رازی دەبێت؟ ئەو مارەییدا و بەخشی و مارەیی بۆ ماڵی دەزگیرانەکەی نارد. ئەگەر مرگ باوەشی پیا بکات باشترە لەوەی لەگەڵ بووکەکەی ئەم کارە بکەن.

و هەروەها ئەم شێعرانەیشی بۆ هاندان و راپەراندنی خەڵکەکەی خۆی وت:

ايجمل ما يؤتى الى فتياتكم — و انتم رجال فيكم عدد الرمل

و تصبح تمشى فة الدماء عفيرة — جهارا و زفت فة النساء الى بعل

ولو اننا كنا رجالا و كنتم — نساء لكنا لااقر بذا الفعل

فموتوا كراما او اميتو عدوكم — و دبوو لنار الحرب بالحطب الجزل

و الا فخلوا بطنها و تحملوا — الى بلد قفرو موتوا من الهزل

فللبين خيرو من مقام على الاذى — وللموت خير من مقام علة الذل

و ان انتم لم تغضبووا بعد هذه — فكونوا نساء لا تعاب من الكحل

و دونكم طيب النساء فانما — خلقتم لا ثواب العروس و للنسل

فبعدا و سحقا للذى ليس دافعا — و يحتال يمشى بيننا مشية الفحل

واتاکەی: ئەوەی لەگەڵ کچە گەنجەکانی ئێوە دەیکەن، شیاوە؟ لەگەڵ ئەوەی لەناو ئێوەدا، پیاوانی وەك مێرو زۆرن. عەفیرە بەیانیان و شەو بەئاشکرا لەخوێنی خۆی دەتلێتەوە لەگەڵ ئەوەی لەناو ژنە داوێن پاکەکان بەرەو لای مێردەکەی خۆی بەرێکەوتبوو. ئەگەر ئێمە پیاو دەبووین و ئێوە ژن، بەم کارە رازی نەدەبووین. یا پیاوانە بمرن یا دوژمنەکانی خۆتان بمرێنن و بۆ ئاگری شەڕ دار و چیلەکەی زۆر کۆبکەنەوە. وگەرنە لەم ولاتە کۆچ بکەن وبرۆنە شوێنێکی وێران و بێبەرهەم و لەهەژاریدا بمرن. هەمان دوورکەوتنەوە باشتر لەمانەوە بەپەستییە و مردن باشتر لەرازی بوون بەسوکایەتی و پەستی. ئەگەر دوای ئەمە تووڕە نەبن، لەو ژنانە بن کەکل لەچاویان دەکەن و ئەمە بەشەرم نەزانن. بۆنی خۆشی ژنان لەسەر و روخسار دەسون چوونکە ئێوە بۆ جل و بەرگی تاز بووك و زانی منالّ ئافرێنراون. دوور بێت و لەناو بچێت ئەو کەسەی ستەم لەخۆی دوور نەکاتەوە و بەم شێوە لەناو ئێمە هاوشێوەی پیاو بەرێگادا دەروات و خۆی بادەدات.

کاتێك براکەی ئەسوەد قسەکەی بیست (ئەو پیاوێکی بەرێز لەناو خەڵکەکەی بوو) بەخەڵکەکەی خۆی وت: ئەی جەدیسیان، ئەم دەستەی لەناو ئێوەدا دەژین، لەماڵەکانتان لەئێوە بەرێزتر نین. تەنیا لەپێشی ئەوان ئەومیە گەورەکەیان لەسەر ئێوە بەزۆر فەرمانرەوایی دەکات. ئەگەر سستی ئێمە نەبوو، ئەو لەپێش ئێمە نەدەبوو و ئەگەر بەستەم رازی نەدەبووین، دادی خۆمان لێدەسەند. گوێرایەڵی فەرمانەکانم بن تا بۆ هەمیشە بەرێز بن.

کاتێك خەڵکی جەدیس قسەکەیان بیست، خرۆشان و وتیان: لەتۆ فەرمان دەبەین بەلاّم تسمیەکان لەئێمە زۆرترن. وتی: من خواردن بۆ پاشا ئامادە و بانگێشتیان دەکەم. ئەوسا کاتێك بەزێر و زیوی فراوان و جل و بەرگی فراوان بەرەو لای ئێمە دێن، شمشێر دەکێشین و هەموویان دەکوژین. وتیان: ئەم کارە بکە. خواردنێکی زۆری ئامادە کرد و لەدەرەوەی شار سفرەی رازاندەوە و خۆی و خەڵکەکەی شمشێریان لەناو زیخدا حەشاردا. پاشا و خەڵکەکەی بۆ میوانی بانگێشت کرد. ئەوان بەزێر و

زیوی زۆر هاتن و لەسەر سفرە دانیشتن. کاتێك نارامیان گرت و دەستیان بۆ خواردن درێژ کرد، جەدیسیەکان شمشێرەکانی خۆیان دەرهێنا و ئەوانیان لەگەڵ پاشاکەیان کوشت ر دواتر شمشێریان خستە ناو پەستەکان و تۆماری ژیانی هەموویان تەواو کرد.

ئەوسا پاشماوەکانی تسم مەبەستی حسان کوری توبەع پاشای یەمەنیان کرد و داوای هاوکاریان لێکرد. ئەو هاتە یەمامە. کاتێك گشەتە شوێنێك کەسێ رۆژی لەجەدیسیەکان دوور بوو، یەکێك لەناو ئەوان وتی: خوشکێکم هەیە لەناو جەدیسیەکان مێردی کردووە وپێی دەڵێن یەمامە. ئەو سوار لەدووری سێ رۆژ رێگاوە بەباشی دەبینێت. دەترسم ئێوە ببینێت و جەدیسیەکان لەهاتنی ئێوە ئاگادار بکاتەوە. فەرمان بەکەسەکانت بدە هەر کام دارێك هەڵبگرن و لەبەردەم خۆیاندا بیبەنە پێش.

حسان کوری توبەع فەرمانی ئەو کارەی دەرکرد. یەمامە سوپاکەی بینی و بەجەدیسی وت: کەرەکان ناهەنگی ئێوەیان کردووە. پرسیان چی دەبینی؟ یەمامە وتی: پیاوانێك دەبینم کەهەرکام سوار لەسەر دارێکن و دێنە پێش. جەدیسیەکان ئەو ژنەیان بەدرۆزن زانی. لەولا، حسان کوری توبەع بەرەبەیان هێرشی کردە سەر جەدیسیەکان و ئەوانی لەناو برد. لەم کاتەدا یەمامەیان هێنا. چاویان دەرهێنا و بینیان دەماری رەشی تیایە. پرسی: ئەمە چییە؟ یەمامە وتی: بەردی رەشە کە سورمەم پێدەکێشا و پێی دەڵێن (ئێسمەد) (بەردی سورمە). ئەو ژنە یەکەم کەس بوو سورمەی پێدەکێشا. لەناوی ئەم یەمامە بوو ناوی سەرزەمینی یەمامە هاتە ناراوە. زۆر کەس لەوتارەکانی خۆیان ئاماژەیان پێداوە.

کاتێك جەدیسیەکان لەناوچوون، ئەسوەد بکوژی عەملیق بۆ دوو کێوی تەی رایکرد و لەوێ مایەوە. ئەمە پێش ئەوە بوو هۆزی تەی بێتە ئەوێ و نیشتەجێ بێت. هۆزی تەی لەداوێنی تەختی کوێستانی یەمەن دەژیا و ئەوێ ئێستا شوێنی مانەوەی دو هۆزی مۆراد و هەمدانە. ئەسوەد بەردەوام وشتری لەوەڕاو لەخەزانی دەبردە لایان کەزۆر قەڵەو دەبوو( با لەگەڵ کاروانی خەزان خواردنی زۆری بۆ دەبردن)و دەگەرایەوە و ئەوان نەیاندەزانی لەکوێوە دێت. دواتر ئەوان وەك سێبەر و هەنگاو

بەهەنگاو بەدوایدا ڕۆشتن تا لەکێوی ئەجا و سەلما (دوو کێوی تەی) لەنزیکی (فید) مایەوە. ئەوان لەوێ داری خورما و لەوەڕگای زۆریان بینی و ئەسوەد کوڕی عەفاریان دۆزییەوە. ئەویان کوشت. و تەی دوای ئەو لەنێوان ئەو دوو کێوەدا مانەوە و تا ئێستا لەوێن و ئەمە سەرەتای ڕۆشتنی ئەوان بۆ ناوچەیە.

## داستانی هاورێیان ئەشكەوت ئەوان لەسەردەمی پاشای تیرەكان بوون

هاورێیانی ئەشكەوت لەسەردەمی پاشایەك بەناوی دقیوس(دسیوس) بوون كەپێیان دەوت دقیانوس. ئەو لەیەكێك لەشارەكانی رۆم بەناوی ئەفسوس دەژیا. پاشای ئەوان بت پەرست بوو. هاورێیانی ئەشكەوت، بەهەمان شێوەی خوا فەرموویەتی، چەندین گەنج بوون باوەڕیان بەخوا هێنا. وەك دەفەرمێت:( ئێمە هەموو ئایە شەریفەكان كەلە قورئاندا لەبارەی ئەوان هاتووە و زۆر شیرین و دڵگیرە، لێرەدا دەهێنین چوونكە كوری (ئەسیر) بەشێوەیەكی چڕ و پڕ باسی دەكات و كلك براو.

دەفەرمێت: تۆ گومان دەكەیت هاورێیانی ئەشكەوت و ئەو (نوسراوە) لەنیشانە سەرسورهێنەرەكانی بەتوانا بوونی ئێمە نەبوون؟ ئەوسا كەئەو جوامێرانە پەنایان بردە ئەشكەوت و وتیان: خوایە، لەلای خۆتەوە بۆ ئێمە بەخششێك بنێرە و كاری ئێمە راست و رەوان بكە. ئێمە چەندین ساڵ مۆرمان لەگوێچەكانی ئەوان لەو ئەشكەوتەدا. دواترئەوانمان هەستانەوە تا ببینین كام یەك لەو دەستە باشتر دەتوانن ساڵەكانی مانەوەی ئەوان بژمێرن. ئێمە داستانی ئەوان بەراستی و دروستی بۆ تۆ دەخوێنینەوە: ئەوان چەند گەنجێك بوون پشتیان كردە بتپەرستی و باوەڕیان بەخوای خۆیان كرد و ئێمە رێگامان بۆ روناك كردنەوە. دڵیانمان بەهێز كرد چوونكە لەسەر بنەمای باوەڕەكەی خۆیان هەستان و وتیان: خوای ئێمە خوای زەوی و ئاسمانەكانە. جگە لەو هیچ خوایەك بەخوا ناو نابەین چوونكە ئەگەر ئەم كارە بكەین، درۆ و چەوت و نارەوامان وتبێت. خەڵكی ئەم شارەی جیاواز لەو خوایەكیان هەڵبژاردووە. بۆ، بۆ ئەم كارەیان نیشانەیەكی روناك ناهێننەوە؟ كێ ستەمكارتر لەوەیە درۆ بۆ خوا هەڵبەستێت؟ ئێستا ئەی گەنجەكان، ئێوە كە لەم خەڵكە و خواكەیان خۆتان دوور خستۆتەوە، پەنا بۆ ئەشكەوت ببەن تا خواتان خۆشەویستی خۆی بۆ ئێوە بڵاو بكاتەوە و ئارامی بۆ ئێوە ئامادە بكات. هەتاو دەبینی كاتێك دەگەڕێتەوە، تێدەپەرێت لەئەشكەوتەكەی ئەوان بەرەولای راست و كاتێك ئاوا دەبێت تێدەپەرێت لای ئەوان لەلای چەپ. ئەوان لەكەلێنێك لەو ئەشكەوتەدان. ئەمە لەنیشانەكانی خوایە. هەر كەس ئەو بۆ رێگای راستی ببات، رێگای دۆزیەوەتەوە و

هەر کەس ئەو گومڕای بکات، کەس ناتوانێت بۆ ڕێگای ڕاستی بگەڕێنێتەوە. تۆ گومان دەکەی ئەوان لەخەودان بەلأم بەئاگان و ئێمە ئەوان بۆ چەپ و ڕاست دەسوڕێنین. و سەگەکەیان دوو دەستەکەی خۆی لەسەر درگای ئەشکەوتەکە بەشێوەیەکی وا بلأو کردۆتەوە کەئەگەر لەناکاو لێی بڕوانیت، دڵت پڕدەبێت لەترس و بێدرەنگ هەڵدێیت. بەمشێوە ئەوانمان لەخەو هەستان تا لەناو خۆیاندا لەیەك بپرسن. یەك لەناویان وتی: لەم ئەشکەوتەدا چەندە ماونەتەوە؟ وتیان: ڕۆژێك یا زیاتر لەڕۆژێك. وترا: خوا باشتر دەزانێت چەندەیە لێرەین. یەکێك بەو درەمەی هەتانە بۆ شار بنێرن تا جوان بڕوانێت و لەکام شوێنەی زۆر پاك و خاوێنە، خواردنتان بۆ بێنێت. دەبێت وشیار بێت نەکا کەس لەرازەکەی ئێوە ئاگادار ببێتەوە. ئەگەر ئەم خەڵکە دەستیان بەئێوە ڕابگات، بەردبارانتان دەکەن یا دەتانگەڕێنەوە بۆ سەر دینەکەی خۆیان. و ئەگەر بچنە سەر دینی ئەوان، ئیتر هیچ کات ڕوی ڕزگاری نابینن. بەمشێوە ئەوانمان ئاگادار کردەوە تا بزانن موژدەی خوا ڕاستە و گومانێك لەهاتنی ڕۆژی کۆتایی نییە. ئەوسا کە لەبارەی ئەوان لەگەڵ یەکدا کێشەیان بوو و دەیانوت: لێرەدا لەسەر ئەوان دیوارێك دروست بکەن. خوای ئەوان لەکارەکەیان ئاگادارە. ئەوان دەستیان پێیان ڕاگەشتبوو، وتیان: بێ گومان لێرە پەرستگایەك دروست دەکەین. دەستەیەك دەڵێن: ئەوان سیان بوون و چوارەمیان سەگەکە بوو. دەستەیك دەڵێن: پێنج کەس بوون و شەشەمیان سەگەکە بوو. ئەم قسەیە نە لەڕوی ئەندێشەیەکی بەهێز و ڕاست بەڵکو لەسەر گومان و بیری خۆیان لەدنیای پان و بەرین دەهێننە سەر زمان. دەستەیەکیش دەڵێن: حەوت کەس بوون و هەشتەمیان سەگەکە بوو. بڵێ: خوای من لەژمارەی ئەوان ئاگادارترە. ژماری ئەوان جگە لەدەستەیەکی کەم نازانن. کەواتە لەبارەی ئەوان بەوشێوەی لەنوسراوەکە ئاشکرایە، کێشە دروست مەکە و لەبارەی ئەوان هیچ لەم خەڵکە مەپرسە. و هیچ کارێك مەڵێ بەیانی ئەنجامی دەدەم مەگەر بەخواستی خوا. ئەگەر لەبیرت کرد، هەرکات هاتەوە بیرت، ناوی خوا بێنە سەرزمان و بڵێ: هیوادارم خوا من بۆ ڕێگایەکی ڕاستتر لەمە ڕێنوێنی بکات. دووبارە دەڵێن: لەو ئەشکەوتەدا سێسەد مانەوە و نۆیان پێ زیاد کرد ( سێسەد و نۆ ساڵ ژیان). بڵێ خوا باشتر دەزانێت چەندە لەوێ مانەوە. زانستی نادیاری ئاسمان و زەوی

لای ئەوە و ئەو زۆر دوورنەندێش و بیسەرە. ئەوان جگە لەو یار و یاوەرێکیان نییە و ئەو کەس لەفەرمانرەوایەتی خۆی ناکاتە شەریك (کهف/١٨/٨—٢٦).

ئەوەی خوا لەم ئایەتانەدا لە(رقیم) نوسراوە قسە دەکات، مەبەستی بەسەرهاتی کاری ئەوانە کە لەسەر تەختەیەك نوسیان و لەو ئەشکەوتەی پەنایان بۆ بردبوو، هەڵیانواسی. دەستەیەك دەڵێن: یەکێك لەهاورۆژگارانی ئەوان نوسی و لەو بینایەدا بەکاری برد و ناوی ئەوانی لەسەر نوسبوو کە لەرۆژگاری کێدا دەژیان و بۆ رویان کردە ئەوێ.

ژمارەیان بەو پێیەی عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت، حەوت کەسە و هەشتەمینیان سەگەکەیە. دەڵێت: ئێمە هی خەڵکێکی کەمین کەژمارەیان دەزانین. کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هەشت کەس بوون و بەوتەی ئەو هەشتەمین کەسە سەگەکە بوو. ئەوان لەخەڵکی رۆم بوون و بتیان دەپەرستی و خوا ئەوانی بۆ رێگای راست رێنویی کرد و دینەکەیان دینی عیسا بوو.

دەستەیەك گومان دەبەن ئەوان لەپێش مەسیح بوون و مەسیح بوو خەڵکەکەیانی لەبوونی ئەوان ئاگادار کردەوە و خوا دوای بەرز کردنەوەی مەسیح ئەوانی لەخەو هەستان. وتاری یەکەم راسترە.

هۆکاری باوەر هێنانی ئەوان ئەوەبوو یەکێك لەهاورێکانی عیسا هاتە شارەکەی ئەوان و ویستی بڕواتە ناوی. پێیان وت: لەسەر دەروازەی شار بتێکە، هەر کەس بیەوێت بڕواتە ناو شار دەبێت نوێژ بۆ ئەو بتە بکات. ئەو نەڕۆشتە ناوشار و رۆشتە حەمامێکی نزیك شار و تیایدا سەرقاڵی کارکردن بوو. خاوەنی حەمامەکە لەو بەختەوەری و رۆژی و کامرانی بینی و هاورێیان ئەشکەوت دڵیان پێ بەست و ئەو بەسەرهاتی کارەکانی ئاسمان و زەمینی بەوان دەوت و لەرۆژی کۆتایی و هەستانەوە دەدوا بەشێوەیەك ئەویان بەراستگۆ زانی و باوەریان پێی هێنا. بەمشێوە بوو تا کوڕی پاشا لەگەڵ ژنێك هات بۆ حەمامەکە و ئەوی لەگەڵ خۆیدا بردە ژوور. هاورێکەی عیسا سەرکۆنەی کرد. شازادە شەرمی کرد بەڵام جارێکیتر گەرایەوە. دووبارە هاورێکەی عیسا سەرکۆنەی کرد و شازادە جنێوی پێدا و دووری کردەوە و لەگەڵ

ژنەکە ڕۆشتە ناو حەمام. ئەو دووانە لەحەمامەکەدا مردن و بەپاشا وترا: کرێکاری حەمام ئەوانی کوشتووە. بەدوایدا گەڕان و نەیاندۆزییەوە. وترا: چ کەسانێك لەگەڵ ئەودا بوون؟ لێردا باسی ئەو گەنجانە کرا. پیاوانی پاشا بەدوای ئەواندا گەڕان و ئەوان رایان کرد و لای یەکێك لەهاورێکانی خۆیان تێپەرین کەلەناو مەزراکەی خۆی کاری دەکرد. بەسەرهاتەکەی خۆیانیان بۆ گێرایەوە و ئەویش بووە هاورێیان و سەگەکەیشی بەدوای ئەواندا بەرێکەوت. ڕۆشتن و شەو پەنایان بردە ئەشکەوتێك. وتیان: شەو لێرە بەسەر دەبەین تا بزانین بەیانی دەتوانین چی بکەین. ڕۆشتنە ناوی و تیایدا کانی و میوەیان بینی. لەناو میوەکانیان خوارد و کاتێك درەنگ بوو، خوا مۆری خستە سەر گوێچکەی ئەوان و فریشتەکانی بەسەر سەرەوە دانان کەئەوانیان بۆ چەپ و راست دەسوڕاند تا زەوی جەستەی ئەوان نەخوات و نەرزێنێت. خۆر بەردەوام تیشکی خۆی دەپرژاندە سەریان.

پاشا دقیانوس بەسەرهاتی ئەوانی بیست و لەگەڵ هاورێکانی شوێنیان کەوت. جێگەی پێکانی ئەوانیان تا لای ئەشکەوتەکە بینی و زانیان ڕۆشتونەتە ناو ئەشکەوتەکە. ئەو فەرمانی بەپیاوەکانی خۆیدا برۆنە ناو و بیانهێننەدەر. هەر پیاوێك دەیویست بڕواتە ناو گێرۆدەی ترس دەبوو و دەگەڕایەوە و رایدەکرد. یەکێك لەناو ئەوان وتی: مەگەر ئەگەر بەردەستت دەکەوتن هەموویانت نەدەکوشت!؟ پاشا وتی: بەڵێ. ئەو پیاوە وتی: دەرگای ئەشکەوتەکە بگرن تا لەبرسیەتی و تینویەتی بمرن. پاشا ئەم کامری کرد و ئەوان رۆژگارەکیانیان یەك لەدوای یەك بەسەر دەبرد.

شوانێك بارانی لێباری و بەخۆی وت: دەرۆمە ناو ئەم ئەشکەوتە و ئاژەڵەکانی خۆم دەبەمە ئەوێ. ئەو درگای ئەشکەوتەکەی کردەوە و خوا گیانی ئەوانی بۆ گەڕاندنەوە. بەشێوەیەکی وەك بڵێی بەیانی رۆژی خەوتنیانە (هەرچەندە سەدان ساڵ تێپەریبوو). ئەوان یەکێکیان لەناو خۆیان بەکاغەزی زێر نارد تا خواردنیان بۆ بکرێت و بهێنێت. ناوی تەلیخا بوو. کاتێك گەشتە دەروازەی شار، شتی وای بینی بووە هۆی سەرسورمانی چوونکە ئاشنایی لەگەڵ ئەوانەدا نەبوو. دواتر هاتە لای پیاوێك و پێی وت: بەم درەمە خواردن بەمن بفرۆشە. فرۆشیار وتی: ئەم درەمانەت لەکوێوە هێناوە؟ تەلیخا وتی: من و هاورێکانم دوێنێکە ڕۆشتینە دەر و کاتێك بەیانی

ئەمرۆ داهات، منیان نارد تا خواردن بکرم. فرۆشیار وتی: ئەم دەرمە لەسەردەمی فلأن پاشادا بووە. ئەو درەمەکانی بردە لای پاشا کەپیاوێکی لەخوا ترس بوو. ئەو پرسیاری کرد و تەلیخا بەسەرهاتەکەی خۆیانی گێرایەوە. پاشا پرسی: هاورێکانی تۆ لەکوێن؟ تەلیخا وتی: لەگەڵ مندا وەرن. ئەوان لەگەڵیا بەرێکەوتن تا گەشتنە دەروازەی ئەشکەوتەکە. ئەو وتی: رێگە بدەن پێش ئێوە برۆمە لای هاورێکانی خۆم ئەکا دەنگی ئێوە ببیستن و بترسن و گومان بکەن دقیانوس ئاگاداری شوێنەکەمان بۆتەوە. تەلیخا هاتە لایان و باسەکەی بۆ گێرانەوە. ئەوان وەك سپاس کردن نوێژیان بۆ خوا برد و داوایان لێکرد بیانمرێنێت. خوا وڵامی دانەوە و مۆری لەگوێچکەی ئەوان دایەوە. پاشا ویستی برواتەناو، بەڵام هەر پیاوێك دەیویست برواتە ناو گیرۆدەی ترس دەبوو و دەگەرایەوە و هەڵدەهات. نەیانتوانی برۆنە ناو و پاشا لەوێدا کەنیسەیەکی دروست کرد تا ببێتە پەرستگایەك بۆ پەرستنی خواوەند.

عێکرمە دەڵێت: کاتێك خوا ئەوانی بەئاگا هێنایەوە، پاشای ئەو سەرزەمینە لەوکاتەدا پیاوێکی باوەڕدار بوو و خەڵکی وڵاتەکەی لەبارەی رۆح و جەستە و هەستانەوەی ببوون بەدەستە دەستە و ناسازگاری لەنێوانیاندا هاتبوە ئاراوە. بێژەرێك وتی: خوا رۆح هەڵدەستێنێتەوە نەجەستە. یەکیتر وتی: هەر دووکیان هەڵدەستنەوە. ئەو کارە لای پاشا گران بوو. لەدرگای خوا پاڕایەوە و گریا تا راستی و دروستی بۆ ئاشکرا بکات. لەم کاتەدا، لەبەربەیان، خوا هاورێکانی ئەشکەوتی هەستانەوە و کاتێك خۆر هەڵهات، بەیەکیان وت: دوێ شە پەرستینی خوامان لەبیر کرد. بەرەو ناو رۆشتن (لەو ئەشکەوتەدا کانی و داری زۆری لێبوو) لەناکاو بینیان کانی و دارەکان وشك بوون. بەیەکیان وت: سەرسورهێنەرە. ئەم کانییە لەیەك شەودا وشك بووە و هەروەها دارەکانیش. خوا برسی کردن. یەکیان وتی: کێ دەرواتە شار؟ (دەبێت بروانێت کام خواردنە لەهەمووی پاك و خاوێنترە بۆ ئێمەی بێنێت و وردبین و وشیار بێت و کەس لەئێمە ئاگادار نەکاتەوە).

یەکێك لەوان رۆشتە شار تا خواردن بکرێت. کاتێك بازاری بینی، رێگاکانی ناسیەوە بەڵام روخسارەکانی نەناسیەوە و نیشانەکانی باوەڕدار بوون بەخوای بینی. هاتە لای

پیاوێك تا خواردنی لێبکرێت. فرۆشیار درەمەکانی بەناناشنا بینی و گەیاندییە پاشا. گەنجەکە وتی: ئایا پاشای ئێوە فلان کەس نییە؟ فرۆشیار وتی: نە فلان کەسە. لەم وتەیە سەری سوڕما و کاتێك رۆشتە لای پاشا، بەسەرهاتی هاورێکانی خۆی گێرایەوە. پاشا خەڵکی کۆکردەوە و وتی: ئێوە لەبارەی هەستانەوەی جەستە و رۆح دژایەتیان بوو. خوا بۆ ئێوە ئەم پیاوەی لە فلان خەڵك وەك نیشانە ناردووە (یانی لەرۆژگاری پاشا کۆنەکانەوە هەڵیستاندوونەوە). گەنج وتی: من ببەنە لای هاورێکانم. پاشا سوار بوو. خەڵك بەدوایدا بەرێکەوتن و کاتێك گەشتنە دەرگای ئەشکەوتەکە، گەنج بەپاشای وت: رێگە بدەن پێش لەئێوە برۆمە لای هاورێکانم و ئاگاداریان بکەمەوە تا کاتێك دەنگی سمی ئەسپەکانی ئێوە و ئاوازی خۆتان دەبیستن، گومان نەکەن ئێوە دقیانوسن. پاشا وتی: ئەم کارە بکە. ئەو پێشتر رۆشتە لای هاورێکانی خۆی و ئەوانی ئاگادار کردەوە. ئەوان لەمکاتەدا درێژی مانەوەی خۆیان لەئەشکەوتەدا زانی و لەشادمانیدا گریان و داوایان لەخوا کرد ئەوان لەهەمان کاتدا بمرێنێت تا لەو خەڵکانە هیچ کەس، ئەوان نەبینێت. ئەوان دەستبەجێ مردن و خوا مۆری لەگوێچکەی ئەواندا. کاتێك هاتنەدەرەوەی ئەو گەنجە خایاندی، رۆشتنە ژوورەوە بۆ لای هاورێیان ئەشکەوت و لەناکاو جەستەکانی ئەوانیان بەتازە بینی کەهیچ شتێك ئەوانی دانەپۆشی بوو جگە لەوەی رۆح لەجەستەیاندا نەبوو. پاشا وتی: ئەمە بۆ ئێوە نیشانەیە. ئەو تابوتیکی مسینی بینی کەمۆریان لێدابوو. کردیەوە و تەختەیەکی مسینی تیا بینی کەناوی هاورێیانی ئەشکەوتی تیا نوسرابوو وباسی ئەوەی دەکرد ئەوان لەپاشا دقیانوس رایان کردووە تا نەکا زیان لەدینەکەی ئەوان بدات. ئەوان پەنایان بۆ ئەم ئەشکەوتە هێناوە. کاتێك دقیانوس ئاگادار بۆتەوە درگای ئەشکەوتەکەی بەستووە. هەر کەس ئەم نوسراوەی ئێمە بخوێنێتەوە دەبێت لەکاری ئەوان ئاگادار ببێتەوە.

کاتێك خوێندیانەوە، سەریا سورما و نوێژیان بۆ خوا برد کەئەم نیشانەی رۆژیی دوایی بەوان داوە. هەموویان دەنگی خۆیان بۆ پەرستنی خوا بەرز کردەوە.

دەستەیەك دەڵێن: پاشا و هاورێکانی هاتنە لای گەنجەکان و ئەوانیان بەزیندوو بینی،

روخساریان درەوشاوە بوو و جلەکانیان تازە. گەنجەکان پێیان وتن چیان لەپاشاکەیان دقیانوس بینیوە. پاشا ئەوانی لەئامێز گرت و ئەوان لەگەڵ ئەودا دانیشتن و نوێژیان بۆ خوا برد. دواتر پێیان وت: تۆ بەخوا دەسپێرین. ئەوسا گەڕانەوە بۆ شوێنی خەوەکەی خۆیان و بەهەمان شێوەیان لێهاتەوە کە لەسەرەتاوە بوون. پاشا بۆ هەرکام تابوتیکی زێرینی دروست کرد. کاتێك خەوت، ئەوانی بینی لەخەودا پێی دەڵێن، ئێمە لەزێر دروست نەبووین بەڵکو لەگڵ و بۆ گڵ دەگەڕێینەوە. لەم کاتەدا تابوتی داری بۆ دروست کردن(تا کەسانێتر لێیان بترسن) و پاشا لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا مزگەوتێکی گەورەی دروست کرد و جەژنێکی گەورەی بەست.

ناوی گەنجەکان بەمشێوە بوو: مەکسلمینیا، یەملیخا، مرتوس، نیرویس، کستومس، دنیموس، ریتوفس، دەستەیەك مەخسلمینیا یان وتووە. ئەمانە نۆ ناون و ئەمە راستترینی گێرانەوەکانە. سەگەکەیان قەتمیر بوو. و خوازاناترە.

## داستانی یونس کوڕی متی

داستانی ئەو لەسەردەمی پاشای تیرەگان بوو.

دەڵێن: لەناو پێغەمبەران تەنیا دووانیان بەناوی دایکیان بانگ کردووە یەکیان عیسی کوڕی مریەم و ئەویتریان یونس کوڕی متی. متی دایکی ئەو بوو.

ئەو خەڵکی یەکێك لەدێهاتەکانی موسڵ بەناوی ئەینەوا بوو. خەڵکەکەی بتپەرەست بوون و خوا وەك پێغەمبەر ئەوی بۆ لای ئەوان نارد تا لەبتپەرەستی دووریان بکاتەوە و بۆ خواپەرەستی هانیان بدات. ئەو بۆ ماوەی سی و سێ ساڵ لەناو ئەواندا مایەوە و ئەوانی بۆ خواپەرەستی هاندا بەڵام کەس جگە لەدوو پیاو باوەڕیان پێ نەهێنا. کاتێك لەباوەڕ هێنانی ئەوان بێ هیوا بوو، لەخوا پاڕایەوە. پێی وترا: چەندە زوو بۆسەر بەندەکانت بانگ کرد. بۆ لای ئەوان وەگەڕێ و بۆ ماوەی چل ڕۆژیتر ئەوان بۆ خواپەرەستی هانبدە. ئەو سی و حەوت ڕۆژ لەناویاندا مایەوە و کەس وەڵامی نەدایەوە. یونس بەوانی وت: سێ ڕۆژیتر ئەشکەنجە بەسەر ئێوەدا دەبارێت و نیشانەکەی ئەوە بێت ڕەنگی ئێوە دەگۆڕێت. کاتێك بەرەبەیان بوو، ڕەنگی ئەوان گۆڕا. ئەوان وتیان: ئەوەی یونس دەیفەرموو بەسەر ئێوەدا باری و ئێمە درۆمان لەو نەبیستووە. ئەگەر شەو لەناو ئێوەدا بەسەر ببات لەئەشکەنجە پارێزراو دەبن و ئەگەر ڕۆشتەدەر بزانن لەبەرەبەیاندا ئەشکەنجە بەسەر ئێوەدا دەبارێت.

کاتێك شەوی چلەم گەشت، یونس لەهاتنی ئەشکەنجە دڵنیا بوو و لەناو ئەوان ڕۆشتەدەر. کاتێك بەیانی داهات، ئەشکەنجە بەسەر ئەواندا داباری. بارانێکی ڕەش هات کەدووکەڵ تیایدا بڵێسەی دەسەند. دواتر هاتەسەر شار و سەربانەکانی ئەوانی ڕەش کرد. کاتێك ئەمەیان بینی، لە لەناوچوونی خۆیان دڵنیابوون و بەدوای یونسدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە و خوا تۆبەی خستە دڵیانەوە. ئەوان دڵیان بەخوا بەست و ڕۆشتنە لای پیرێك و پێیان وت: ئەوە دەبینی بەسەر ئێمەدا دابارییەوە، چی بکەین؟ وتی: بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و باوەڕی بێنن و بڵێن: ئەی زیندووی پایەدار، ئەی زیندوو لەکاتێکدا هیچ زیندووێك لەکاتی تۆدا نەبوو، ئەی زیندووی زیندووکەرەوەی مردووەکان، ئەی زیندووێك کەجگە لەو خوایەك نییە. ئەوان لەدێ هاتنەدەر و ڕۆشتنە شوێنێکی بەرز و بەربلاو و هەر بوونەوەرێکیان لەمناڵەکانیان

دوور کردەوە و دواتر لەدەرگای خوا پاڕانەوە و گریان و داوای لێبووردنیان کرد و ستەمیان لەناو برد  ماڤ یەکیان بەتەواوەتی بۆ یەك گەڕاندەوە بەشێوەیەك دەستەیەکیان بەردیان لەناو بیناکانیان دردەهێنا و بۆ خاوەنەکانیان دەگەڕاندەوە.

خوا ئەشکەنجەی لەوان دوور خستەوە و ئەمە لەرۆژی دەی محرم لەرۆژی چوارشەممە بوو. دەستەیەك دەڵێن: چوارشەممەی نیوەی شەوال بوو. یونس لەشوێنێکدا ماوەیە و بەسەرهاتی خەڵکەکەی بیست. رێبوارێك لای ئەو تێپەری. پرسی: خەڵکی دێ چییان کرد؟ وتی: بۆ لای خوا گەڕانەوە و خوا تۆبەی لێ وەرگرتن و ئەشکەنجەی دوور خستەوە. یونس تووڕە بوو و وتی: سوێند بەخوا هاوشێوەی درۆزێنك ناگەرێمەوە. جگە لەدێ کەی یونس هیچ دێ یەك نەبوو خوا دوای ناردنی ئەشکەنجە، ئەوانی لەئەشکەنجە دوور خستبێتەوە. بە رووگرژی لەخوا گەرایەوە، پیاوێکی بەپەلە و نائارام بوو. لەبەر ئەمە خوا خەڵکەکەی خۆی لەم کارە بەدوور دەگرت. خوای گەورە دەفەرمێت: وەك خواوەندی ماسی مەبە( قلم/٦٨/٤٨).

کاتێك رۆشت گومانی برد خوا دەستی پێی ناگات یانی ئەو سزا نادات. دەستەیەك دەڵێن: یانی زیندان لەسەر ئەو تەنگ ناکات. بەرێکەوت و رۆشتە ناو کەشتی و کەشی گیرۆدەی گێژەلوکە بوو. دەستەیەك دەڵێن: بەو شێوە نییە بەڵکو خۆی وەستا و نەرۆشت. یەکیان وتی: ئەمە لەگوناحی یەك لەئێوەیە. یونس وتی: گوناح لەمنە، من بخەنە ناو دەریا. ئەوان ئەم کارەیان نەکرد تا تیرەکانیان بۆ هەڵبژاردن هاویشت. ئەو تیری هاویشت و گرفتار بوو(صافات/٣٧/١٤١). ئەویان نەخستە دەریاوە، سێ جار ئەم کارەیان دووبارە کردەوە بەڵام ئەویان نەخستە ناو دەریاوە. ئەو خۆی خستە دەریاوە و ئەمە لەکاتی شەودا بوو. خوا بەماسی فەرموو قوتی بدات بەڵام گۆشتی گاز نەگرێت و ئێسقانی نەشکێنێت. ئەو یونسی قووت دا و بۆ شوێنی مانەوەی خۆی لەدەریا گەرایەوە. کاتێك گەشتە ئەوێ دەنگێکی بیست. بەخۆی وت: ئەمە چییە؟ خوا لەسکی ماسیدا وەحی پێکرد و فەرمووی: ئەمە پاڕانەوەی بوونەوەرەکانە. ئەویش لەسکی ماسیدا لەخوا پاڕایەوە. فریشتەکان پاڕانەوەی ئەویان بیست و وتیان: خواوەندا پاڕانەوەیەکی کز لەسەرزەمینێکی نامۆ و نائاشنا دەبیستین. فەرمووی: ئەوە بەندەی من یونسە. نافەرمانی کرد و من لەناو سکی ماسیدا زیندانیم کرد.

فریشتەکان وتیان: ئایا ئەمە هەمان بەندەی شیاوە کەرۆژانە کاری چاکەی دەکرد؟ فریشتەکان بەخشینی ئەویان لەخوا داوا کرد. ئەو لەنێوان تاریکی – تاریکی ناو سکی ماسی و تاریکی دەریا- هاواری کرد جگە لەتۆ خوایەك نییە. پاکی شیاوی تۆیە و من لەگوناحکارانم (انبیا/٢١/٧٨). پێش لەمە کاری چاکەی زۆری کردبوو. خوا لەبارەی ئەو ئەم ئایەی فەرمووە، ئەگەر لەو کەسانە نەبوو کەدەپارێنەوە تا رۆژی هەستانەوە لەناو سکی ئەو ماسییەدا دەبوو(صافات/٣٧/١٤٤،١٤٣.) داستان بەم شێوەیە کە هەر کارێکی باشە ئەنجامدەرەکەی لەکاتی کەوتن هەڵدەستێنێتەوە. ئێمە ئەومان خستە هامون و ئەو نەخۆش بوو(صافات/٣٧/١٤٥). کەوتە قەراغ دەریا و لەمناڵێك دەچوو. لەسکی ئەو ماسیەدا چل یا بیست یا سێ یا حەوت رۆژ مایەوە. و خوا زاناترە.

خوا دارێکی لە (یقطین) یانی (قرع) کەدو بۆ ئەو رواند کەشیری بەسەردا دەپرژاند. دەستەیەك دەڵێن: خوا بزنە کێویەکی مێچکەی بۆ نارد کەبەرەبەیان و شەوانە شیری پێدەدا تا هێزی گرت و بەرێکەوت. رۆژێك بۆ لای داری کەدو گەرایەوە و بینی وشك بووە. خەمبار بوو و گریا. خوا سەرکۆنەی کرد و فەرمووی: ئایا بۆ دارێك دەگری و بۆ سەدان هەزار کەس کەدەتویست لەناویان ببەیت داخ ناخۆیت؟

خوا فەرمانی پێدا بۆلای خەڵکەکەی خۆی بگەرێتەوە و ئاگاداریان بکاتەوە کەخوا لەوان خۆش بووە. مەبەستی رۆشتن بۆ لای ئەوانی کرد و لەرێگا شوانێکی بینی. لەوی پرسی: رۆژگاری خەڵکی یونس چۆنە؟ وتی چاوەروانی گەرانەوەی ئەون و دەیانەوێت پێغەمبەرەکەی خۆیان ببینن؟ یونس وتی: ئەوان ئاگادار بکەرەوە کەبۆ لایان دەگەرێمەوە. شوان وتی: بەبێ بەڵگە ناتوانم. یونس یەکێك لەمەرەکان وئەو شوێنەی لەوێ بوون و هەروەها بەدارێکی وت شایەتی بۆ بدەن. پێی وت: ئەمانە بۆ تۆ شایەتی دەدەن. شوان بۆ لای خەڵکەکەی گەرایەوە و بۆی باس کردن. ئەوان ویستیان بیکوژن. وتی: پەلەمەکەن تا بەیانی دێت. کاتێك بەیانی بوویەوە ئەوانی بردە ئەو شوێنەی چاوی بەیونس کەوتبوو و داوای شایەتی دانی لێکرد. زەوی شایەتی دا و دار و مەریش. یونس لەوێ خۆی داشاردبوو. مەر وتی: ئەگەر بەدوای پێغەمبەری خوادا دەگەرێن، لەوێیە. رۆشتنە ئەوێ و کاتێك دۆزییانەوە، دەست و قاچیان ماچ کرد و دوای نافەرمانی داوای گەرانەوەیان لێکرد. یونس لەگەڵ ژن و مناڵەکانی خۆی چل

ڕۆژ مایەوە و داتر بۆ گەڕان هاتەدەر. پاشایش لەگەڵ ئەودا هاتەدەر و پاشایەتی بەشوانێك سپارد و ئەو چل ساڵ دوای ئەوە کاروباری ئەوانی بەڕێوە دەبرد. دوای ئەوە یونس بۆ لای ئەوان گەڕایەوە.

کوڕی عەباس و شەهر کوڕی حەوشەب دەڵێن: پێغەمبەری یونس دوای هاتنە دەر لەسکی ماسی بوو. ئەم دووانە دەڵێن: خوا لە سوری صافات ئاماژەی پێداوە: ئەومان خستە هامون و ئەو نەخۆش بوو و دارێکی کەدومان بۆ ڕواند و ئەومان بۆ لای سەد هەزار کەس یا زیاتر نارد (صافات/٣٧/١٤٥——١٤٧). شەهر دەڵێت: جبرەئیل هات و وتی: ئەی یونس، برۆ لای خەڵکی ئەینەوا و ئەوان لەهاتنی ئەشکەنجە بترسێنە کەکاتەکەی گەشتووە. یونس وتی: مەرکەبم دەوێت. جبرەئیل وتی: کار لەوە خێراترە. یونس وتی: پێڵاوم دەوێت. جبرەئیل وتی: کار لەوە خێراترە. یونس تورە بوو، سواری کەشتی بوو بەڵام کەشتی نەڕۆشت. دەڵێت: تیریان هاویشت و بەناوی یونس لەناو دەرهات. ماسی هات قوتی بدات. خوا بەماسی فەرموو: ئەومان نەکردۆتە ڕۆزی تۆ بەڵکو تۆ پەناگای ئەویت. ماسی قوتی دا و لەوێ بردی تا گەشتە ئۆبۆڵە. دواتر ئەوی بردە دیجلە و لەسەرزەمینی ئەینەوا لەسکی فڕیدایەدەر.

## ڕوداوەکانی ڕۆژگاری پاشای تیرەکان

یەکێ لەم ڕوداوانە ڕەوانە کردنی سێ نێردراوەکە لەلایەن خواوەندی گەورە بۆ شاری ئەنتاکیەیە. ئەوان لەهاوڕێ نزیکەکانی مەسیح بوون. سەرەتا دوو کەسی نارد کەبیروڕاکان لەسەر ناوەکانیان جیاوازە. ئەوان هاتنە شاری ئەنتاکیە و لەوێ پیرەپیاوێکیان بینی کەمەڕی دەلەوەڕاند. ئەو حەبیبی دارتاش بوو. سڵاویان لێکرد. حەبیب وتی: کێن؟ وتیان: نێردراوانی عیساین و ئێوە بۆ پەرستینی خوای گەورە هان دەدەین. حەبیب وتی: ئێوە نیشانەتان پێیە؟ وتیان: بەڵێ. نەخۆشەکان چاك دەکەینەوە و کوێری سکوما و هەروەها گولیش و ئەم کارە بەفەرمان و هاوکاری خوا دەکەین. حەبیب وتی: کوڕێکم هەیە چەندین ساڵە نەخۆشە. ئەو دووانەی بردە ماڵی

خۆی و ئەوان دەستیان بەسەر کورەکەدا هێنا و دەستبەجێ تەندوروستی بۆ گەرایەوە. قسە وباس لەشاردا بلاو بوویەوە و خوا لەسەر دەستی ئەوان نەخۆشی زۆری چاك کردەوە. ئەوان پاشایەکیان بوو بەناوی ئانتیخس کەبتی دەپەرەستی. بەسەرهاتی ئەو دوو پیاوەی بەگوێ گەشت. ئەوانی بانگ کرد و وتی: کێن؟ وتیان: نێردراوی عیساین کەتۆ بۆ پەرستینی خوای گەورە هان دەدەین. وتی: نیشانەی ئێوە چی بێت؟ وتیان: بەیارمەتی خوا کوێری سکوما و گولەکان چاك دەکەینەوە و نەخۆشەکانیش. وتی: هەستن تا بینەری کاری ئێوە بم. ئەوان هەستان و دەستەیەکیان دانا تا لەوان بدەن.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو دووانە هاتنە ناو شار و بۆ ماوەیەك مانەوە بەلام نەیانتوانی برۆنە لای پاشا. رۆژێك پاشا هاتەدەر و ئەوان ئاماژەیان بەخوادا و بە گەورەیی وەسفیان کرد. پاشا توورە و هەردووکیانی خستە زیندانەوە و یەکی سەد قامچی لێدان. کاتێك بەدرۆزن ناوبران و لێیانیان خوارد، مەسیح، شەمعون سەرۆك حەوارییەکانی نارد تا هاوکارییان بکات. ئەو بەشێوەی نەناس هاتە ناوشار و تێکەڵ بەکەسانی دەوروبەری پاشا بوو و باسی ئەویان بۆ پاشا کرد. ئەوی بانگ کرد و لەهەڵس و کەوتی ئەو رەزامەند و شادمان بوو و دڵی پێبەست و پەسەندی کرد و رێزی لێگرت. رۆژێك بەپاشای وت ئەی پاشا بیستوومە دوو پیاوت خستۆتە زیندانەوە و لێتداون چوونکە تۆیان بۆ سەر ئایینەکەی خۆیان بانگ کردووە. ئایا لەگەڵ ئەوان قسەت کردووە یا وتاری ئەوانت بیستووە؟ پاشا وتی: توورەی بووە رێگر لەم کارە. شەمعون وتی: ئەگەر بفەرمویت، ئەوان بێنین و قسەکەیان ببیستین. پاشا ئەو دووانەی بانگ و وتی: کێ ئێوەی ناردووە؟ وتیان: خوایەك کەجگە لەو خوایەك نییە و شەریکی نییە. پاشا وتی: وەسفی ئەو بۆ من بکەن و درێژدادڕی مەکەن. ئەو دووانە وتیان: خوای ئێمە هەرچی بووێت دەیکات و هەرچی پەسەندی بێت فەرمانی پێدەدات. شەمعون وتی: نیشانەی ئێوە چییە؟ وتیان: هەرچی بتەوێت.

پاشا فەرمانی دا و کورێکیان هێنا و شوێنی هەردوو چاوی بەسترابوو. لەتیکەیەك گۆشت دەچوو. ئەوان لەخوا پارانەوە و بەردەوام داوای باشبوونەوەی ئەویان دەکرد تا شوێنی چاوەکانی قەڵشا و ئەو دووانە و ئەوان دۆ تۆپەڵەی قوڕیان هەڵگرت و

لەشوێنی کاسەی چاوی دایاننا کەبووە هاوشێوەی دوو چاوی راستەقینە و پێڵو و برژانگ و مژۆڵەی بۆ دروست بوو. پاشا لەم کارە سەری سورما وتی: ئەگەر خوای ئێوە کەدەیپەرستن بتوانێت مردووێك زیندو بکاتەوە، بەو و بەئێوە باوەڕ دەهێنم. وتیان: خوای ئێمە بۆ هەر کارێك بەتوانایە. پاشا وتی: لێرە مردووێکە کە حەوت رۆژ بەسەر مردنی تێپەر دەبێت و بەخاکمان نەسپاردووە تا باوکی کە لەدەرەوەی وڵاتە بگەڕێتەوە. مردوویان هێنا کەبۆگەنی کردبوو. ئەو دووانە بەئاشکرا لەخوا دەپاڕانەوە و شەمعون لەدڵدا. مردوو لەشوێنەکەی هەستا و بەخەڵکەکەی خۆی وت: من بتپەرەست مردم و کەوتمە چەندین دۆڵ لە دوزەخ و ئێوە ئاگادار دەکەمەوە کەرێگای ناڕاستتان گرتۆتەبەر. دواتر وتی: درگاکانی ئاسمان کراوەیە و من بینیم، گەنجێکی جوان روخسارم بینی کەلەسێ کەس بۆ خوا دەپاڕایەوە. پاشا وتی: کام سێ کەسە؟ ئەو وتی: ئەمە ( شەمعونی بەدەست نیشاندا) و ئەو دووانە ( و ئەو دوانەی بە پەنجە نیشاندا). پاشا سەری سورما و لەم کاتەدا شەمعون بۆ باوەرهێنان هانیدا. خەڵك باوەڕیان هێنا و پاشایش لەناویاندا بوو. کەسانێتر لەسەر ناباوەڕی خۆیان مانەوە. دەستەیەك دەڵێن بەم شێوە نەبوو، بەڵکو پاشا باوەڕی نەهێنا و ئەو لەگەڵ خەڵکەکەی بۆ کوشتنی نێردراوانی خوا هاودەست بوون. ئەم بەسەرهاتە گەشتە گوێی حەبیبی دارتاش و ئەو لەدەروازەی شار بوو. بەراکردن هات و خوایی بیرخستنەوە و بۆ فەرمانبردن لەخوا هانیدان. ئەمە ئەوەیە خوا دەیگێڕێتەوە و دەفەرمێت: بیر بێنەرەوە ئەو کاتەی بۆ خەڵکی ئەو شارانە دوو نێردراومان نارد و ئەوان بەدرۆزنیان زانین و ئێمە بەسێیەم نێردراو هاوکاریمان کردن(سی/٣٦/١٤). سێیەم کەس هەمان شەمعونە. خوای گەورە ناردنی پێغەمبەرانی بۆ خۆی گەڕاندەوە هەرچەندە مەسیح ئەوانی ناردبوو چوونکە ئەو بەفەرمانی خوای گەورە ئەوانی ڕەوانە کرد.

کاتێك خەڵکی شار، نێردراوانیان بەدرۆزن زانی، خوا بارانی لەوان گرتەوە و خەڵکی شار بەنێردراوانیان وت: ئێمە ئێوە بەشوم دەزانین و ئەگەر لەکارەکەی خۆتان پەشیمان نەبنەوە بێ گومان بەردبارانتان دەکەین یا دەتانکوژین و لەئێمە

ئەشکەنجەیەکی بەئازارتان پێدەبرێت(یس/٣٦/١٨). کاتێك حەبیب هات — ئەو باوەردار بوو—و باوەری خۆی بەخوا دەشاردەوە. رۆژانە کرێی خۆی کۆدەکردەوە و نیوەی بۆ خێزانەکەی خەرج دەکرد و نیوەی لەرێگای خوادا دەبەخشییەوە، وتی: ئەی خەڵکەکەی من، شوێن نێردراوانی خوا بکەون(یس/٣٦/٢٠). خەڵکەکەی وتیان: تۆ ناباوەر بەخوای ئێمەیت و باوەرت بەخوای ئەمانە هەیە؟ حەبیبی دارتاش وتی: بۆ خوایەك نەپەرستین ئێمە ئافراند و ئێوە بۆ لای ئەو دەگەرێنەوە؟(یس/٣٦/٢٢). کاتێك ئەمەی وت، ئەویان کوشت و خوا بەهەشتی کردە شوێنی ئەو و ئەمە هەمان وتەی خوای گەورەیە کەدەفەرمێت: وترا، برۆ ناو بەهەشت، وتی: خۆزگە خەڵکەکەی من دەیانزانی خوا چۆن منی بەخشی و منی خستە ریزی رێزداران(یس/٣٦/٢٧). خوا هەورێکی بۆ ناردن و هەموویان مردن.

## داستانی شەمسون

ئەو لەیەکێك لەدێهاتەکانی رۆم نیشتەجێ بوو کەخەڵکەکەی بتیان دەپەرستی بەڵام ئەو باوەری بەخوا بوو. ئەو لەچەند فەرسەنگی دێکە دەژیا و بەتەنیایی لەگەڵ خەڵکی دێکە شەری دەکرد و کاکیلکەی وشترێکی وەك سیلاح بەکار دەبرد. کاتێگ تینوی دەبوو لەسەر تاشەبەردێك کە لەسەری دەژیا، ئاو هەڵدەقوڵا و لێی دەخواردەوە. ئەو هێزێکی سەیری بوو کەئاسن و پۆڵا و هاوشێوەکانیان توانای بەستنەوەی ئەویان نەبوو. شەمسون شەری لەگەڵ دەکردن و بەسەریانا سەردەکەوت و لەوانی دەکوشت و ئەوان نەیاندەتوانی هیچ کارێکی لەگەڵ دا بکەن. لەبەر ئەمە بەهایەکیان بەژنەکەی پێشنیار کرد تا بیبەستێتەوە و ژن رازی بوو. گوریسێکی ئەستوریان پێدا، ژن چاوەرێ بوو تا مێردەکەی خەوت و ئەوسا بەستییەوە. شەمسون هەستا و تەکانێکی بەخۆیدا و گوریسەکە لەت لەت بوو. ژن پەیامی بۆ ناردن و بۆی باس کردن. ئەوان بەندێکی ئاسنینیان بۆ نارد و ژن چاوەرێی کرد تا هاوسەرەکەی خەوت و ئەوکات مل و دەستەکانی مێردەکەی پێ بەستەوە. شەمسون هەستا و تەکانێکی پێدا و بەندە ئاسنییەکە لەمل و دەستەکانی کەوتە خوار. ئەو هەردووجار

بەژنەکەی وت: بۆ ئەم کارەت کرد؟ ژن وتی: ویستم هێزی تۆ تاقی بکەمەوە چوونکە لەجیهان بە بەهێزی تۆ کەسم نەبینیوە. ئایا شتێك هەیە تۆ بەند بکات و بەسەرتۆدا زاڵ بێت؟ شەمسون وتی: بەڵێ، تەنیا یەك شت. ژن بەردەوام پرسیاری دەکرد تا شەمسون وتی: هاوار لەتۆ، هیچ شتێك جگە لەقژم نامبەستێتەوە. کاتێك شەمسون خەوت، ژن دودەستەکەی بەقژە درێژەکانی بەستەوە و پەیامی بۆ خەڵك نارد. ئەوان هاتن و لوت و گوێچکەیان بڕی و چاوەکانیان کوێر کرد و ئەویان بۆ سەیر کردنی خەڵك بەپێوە ڕاگرت. پاشا هات تا لێی بڕوانێت. ئەو شارە لەسەر ستونەکان جێگیر بوو. شەمسون لەخوا پاڕایەوە تا ئەو بەسەر ئەواندا زاڵ بکات. خوا وەحی پێکرد: دو ستون لەستونەکانی شار بگرێت و بەرەو لای خۆی بکێشێت. خوا سۆمای چاوەکانی بۆ گەڕاندەوە و ئەوەی لەجەستەی لەناویان بردبوو، چاکی کردەوە. ئەو دوو ستونەکەی گرت و بەرەو لای خۆی ڕایکێشا. شار بەسەر پاشا و خەڵکدا کەوت و لەناوی بردن. شەمسون لەرۆژگاری پاشای تیرەکان بوو.

## داستانی جەرجیس

دەڵێن: لەشاری موسل پاشایەك بەناوی دازانە(ڕازانە) دەژیا و ئەو پیاوێکی گەردنکێش و زاڵم بوو. جەرجیس پیاوێکی چاکەخواز لەدانیشتوانی فەلەستین بوو کەخۆی و هاورێکانی باوەڕی خۆیان بەخوا دەشاردەوە. ئەوان پاشماوەی رۆژگاری حەوارییەکانیان بینیبوو و فێرکارییە دینییەکان لەوان فێرببوون. جەرجیس بازرگانی دەکرد و نیوەی داهاتەکەی خۆی لەرێگای خوا دەبەخشی. هەندێ کات سامانەکەی بەهۆی بەخشین لەرێگای خوا کۆتایی دەهات و ئەو جارێکیتر دەستی پێدەکردەوە و بەدەستی دەهێنایەوە. ئەگەر بەخشین لەرێگای خوا ( و ناو و ناوبانگی چاکەی بەدەست هاتوو لێی) نەبوو، هەژاری لەدارایی پێ باشتر بوو. چوونکە ئەو لەشام بوو، دەترسا زیان بەدینەکەی بگات ولەبەر ئەمە مەبەستی ڕۆشتن بۆ موسڵی کرد. لەگەڵ خۆی دیاری بۆ پاشا برد تا ڕێگە نەدات کەس ئازاری بدات. کاتێك جەرجیس هاتەلای، پاشا گەورەکانی خەڵکەکەی خۆی کۆکردبوویەوە و ئامرازەکانی ئەشکەنجەی جۆراوجۆری ئامادە و بتێك بەناوی ئەفلون (ئەفلوون)ی دروست

کردبوو. هەر کەس نوێژی بۆ ئەو بتە نەدەکرد ئەشکەنجەی دەدا و دەیخستە ناو ئاگر.

کاتێك جەرجیس ئەم کردارەی بینی، لەدڵی خۆیدا بۆ دژایەتی کردنی پەیمانی بەست. ئەو دەستی بۆ سەر سامانەکەی خۆی درێژ کرد و هەمووی بەسەر خەڵکی ئەو سەرزەمینە بەخشی و دواتر بەرق و توورەی زۆر ڕۆی کردە پاشا و وتی: بزانە تۆ کۆیلەیەکیت بۆ گەورەکەت و بۆ خۆت و کەسەکانت هیچت نییە و کارێك ناتوانیت بکەیت. لەسەر سەری تۆ خواوەندێکە تۆی ئافراندووە و ڕۆژی پێ بەخشیوی. بەردەوام باسی گەورەیی خوا و ریسوایی بتەکەی دەکرد. پاشا بەم شێوە وەڵامی دایەوە: تۆ کێیت و لەخەڵکی کوێیت؟ جەرجیس وتی: بەندەی خوام و کوری کەنیزێکی ئەو. لەگڵ دروست کراوم و بۆ گڵ دەگەرێمەوە. پاشا پێشنیاری پەرەستنی بتەکەی پێکرد و وتی: ئەگەر خواوەندی تۆ خوای هەموو جیهان بێت نیشانەکەی بۆ تۆ دەردەکەوێت بەهەمان شێوە کەمن بەپاشای پاشاکانی خەڵکەکەی خۆت دەبینی. جرجیس بەوەسف کردنی گەورەیی خوا وەڵامی دایەوە و پێی وت: ئایا ئەفلون دەپەرەستی کەنەدەبیستێت و نەدەبینێت و نە لەبەردەم خوای جیهان دەتوانێت کارێك بکات؟ یا ئەوە دەپەرەستی کەزەوی و ئاسمانەکان بەفەرمانی ئەو لەشوێنی خۆیاندا وەستاون؟ یا (ترکلینا) دەپەرەستی کەزادەی مرۆڤ بوو و دەیخوارد و دەیخواردەوە و خوا رێزی لێگرت و کردییە پیاوێکی فریشتە ئاسا. یا سەروەری خۆت مەخلیتیس دەپەرەستی کەئەو هەموو شتەی لەفەرمانرەوایی تۆ لەعیسای دۆزییەوە و دەریخست. ئەو ئاماژەی بەو گەورە و رێزدارە دا و هەندێ لەمۆجیزەکانی باس کرد و رێز گرتنی ئەوی لەلایەن خواوە بەبیر هێنایەوە.

پاشا وتی: بۆ ئێمە ئەو شتانەت باس کرد ئاشنا نین پێی. دواتر ئەوی لەنێوان نوێژ کردن بۆ بتەکە و بینینی ئەشکەنجە ئازاد کرد. جەرجیس وتی ئەگەر بتەکەی تۆ ئاسمانی راگرتبێت ( و بەم شێوە و بەو شێوە لەکارە گەورەکانی خوای جیهانی کردبێت) تۆ بەراستی گەشتویت. وگەرنە سوك و ریسوا بە ئەی نفرین کراوی خوا.

کاتێك پاشا ئەمەی بیست، فەرمانی دا زیندانی بکەن و گۆشتی جەستەی بەشانە ئاسنینەکان ببڕن و رەگەکانی ئەو بقرتێنن. هەروەها لەناو سرکە و خەردەل

بیخەوێنن. ئەو نەمرد. کاتێك بینی ئەم ئەشکەنجانە نەیکوشتووە، فەرمانیدا شەش بزماری ئاسنیان هێنا و خستیانە ناو کورەی ئاگر تا بەتەواوی سوور بوونەوە. ئەوسا بزمارەکانیان بەهەموو شوێنێکی جەستەیدا کرد. مێشکی پرژی و دووبارە خوا بەزیندویی هێشتییەوە. کاتێك بینی بەم ئەشکەنجەیش نەکوژرا. فەرمانیدا حەوزێکیان پڕ لەمس کرد و ئاگریان خستە ژێری کەیەکپارچە بوو بەئاگر. ئەوسا ئەوی خستە ناوی و سەرەکەی داپۆشی تا سارد بوویەوە. بینی ئەمە ئەشکەنجەیش نەبووە هۆکاری کوشتنی. وتی: ئایا تامی ئەشکەنجەت نەچێشتووە؟ جەرجیس وتی: خوای من ئەشکەنجەی تۆی لەمن دوور کردەوە و خۆراگری بەمن بەخشی تا بەڵگەی خۆی نیشان تۆدابێت.

پاشا لەزیان دڵنیا بوو و بۆ خۆی و پاشایەتییەکەی ترسا. بڕیاریدا بۆ هەمیشە بیخاتە زیندانەوە. گەورەکانی خەڵکەکەی وتیان: ئەگەر ئەو لەزیندانا بەجێ بێڵیت لەگەڵ خەڵك قسە دەکات و ئەوان شوێن خۆی دەخات و پشت لەتۆ دەکەن. ئەشکەنجەیەکی بدە تا لەقسە کردن بێستێت. پاشا فەرمانیدا بەسەر سکدا خەواندیان و دواتر دەست و پێیان بەبزماری ئاسن بەزەویدا داکوتا. ئەوسا فەرمانیدا ستونێکیان لەمەرمەر هێنا(کە هەژدە پیاو هەڵیاندەگرت) و خستیانە سەر پشتی. رۆژێکی تەواو لەژێر ئەو ستوونەدا مایەوە. کاتێك شەو داهات خوا فریشتەیەکی نارد و ئەمە یەکەمجار بوو فریشتەکان هاتنە یارمەتی. فریشتە هات و یەکەم کار کە بەپێی وەحی ئەنجامی دا، ئەوە بوو بەردەکەی لەسەر هەڵگرت و بزمارەکانی هەڵکەند و خواردن و خواردنەوەی دەرخوارددا و دڵنەوایی کرد و موژدەی پێدا. کاتێك بەرەبەیان گەشت، ئەوی لەزیندان رزگار کرد و پەیامی خوای بەم شێوە پێ وت: روبەروی دوژمنەکەی خۆت ببەرەوە و شەڕی لەگەڵدا بکە. من تۆ گرفتاری ئەو دەکەم بۆ ماودی حەوت ساڵ و لەم ماوەدا چوار جار تۆ دەکوژێت و من هەرجار رۆح بۆ گیانی تۆ دەگەڕێنمەوە و کاتێك جاری چوارەم هات رۆحی تۆ بۆ لای خۆم دەبەم و پاداشتی تۆ دەدەم.

پاشا نەهاتبووە خۆی کەجەرجیسی لەسەر سەری خۆی بینی کەبۆ خواپەرەستی هانی دەدا. پاشا وتی: جەرجیسی؟ وتی: ئەرێ. وتی: کێ تۆی لەزیندان رزگار کرد؟ وتی:

ئەو کەسەی پاشایەتییەکەی بەرزتر لەپاشایەتی تۆیە.

پاشای تورە چەندین جۆر ئەشکەنجەی ئامادە کرد و فەرمانیدا ئەویان لەنێوان دوو داردا راگرت و شمشێریان لەسەر سەردانا و زەختیان لێکرد بەشێوەیەك شمشێر لەنێوان دوو قاچی هاتەخوار و بوو بەدوو کەرت. دواتر ئەویان تیکە تیکە کرد. پاشا حەوت شێری درندەی لەچاڵێکدا راگرتبوو. جەرجیسیان فڕێدایە ناو چاڵەکە و کاتێك شێرەکان ئەویان بینی، بۆ رێزلێنان لەو سەریان دانەواند. لەسەر قاچی خۆیان وەستان و لەهیچ هەوڵێك درێغیان نەکرد تا ئازار لەو دوور بکەنەوە. ئەو رۆژە بەمردوویی لەوێ مایەوە و ئەمە یەکەم مەرگێك بوو تامەکەی دەچێشت. کاتێك شەو داهات، خوا تیکەکانی جەستەی کۆکردەوە بەهەمان شێوەی یەکەمی و گیانی پێ بەخشییەوە و لەچاڵەکە دەریهێنا. کاتێك ئەویان بینی دێت، وتیان: ئەم پیاوە زۆر لەجەرجیس دەچێت. پاشا وتی: ئەوە خۆیەتی. جەرجیس وتی: بەراستی منم. چەندە خەڵکانێکی خراپن ئێوە! منتان کوشت و تیکە تیکەتان کردم و خوا گیانی پێ بەخشیمەوە. باوەڕ بەخوی گەورە بێنن کە بەهێزی ئەوتان بینی. وتیان: جادوگەرێکە دەست و چاوی ئێوەی لەخۆی جادو کردووە. ئەوان جادوگەرانی شارەکانی خۆیان کۆکردەوە و کاتێك هاتن، پاشا بەگەورەی ئەوانی وت: جادووی خۆت نیشانی من بدە تا خەم لەدڵی من بسرێتەوە. ئەو مانگایەکی بانگ کرد و فوی بە دوو گوێچکەیدا کرد لەناکاو بوو بەدووان. هەروەها تۆوی گەنمی هێنا لەیەك ساتدا پرژاندی و چاندی و هەڵیگرت و کوتای و بێژایی و کردیە ئارد ونانی دروست کرد و خواردی. پاشا وتی: ئایا دەتوانیت جەرجیس بکەیتە سەگ؟ وتی: دەفرێکی پڕ ئاوم بۆ بێنن. ئاویان هێنا. جادوگەر فوی تێکرد و دواتر پاشا بەجەرجیسی وت: بیخۆرەوە. جەرجیس هەمووی خواردەوە. جادووگەر وتی: چی دەبینیت؟ جەرجیس وتی: هەموو شتێك بەباشی دەبینم. تینو بووم خوا بەزەیی پیامداهاتەوە و منی بەئاو گەیاند. جادوگەری گەورە روی کردە پاشا و وتی: ئەگەر لەگەڵ یاخییەکی ستەمکاری وەك خۆت روبەرو دەبوویتەوە، سەردەکەوتیت. تۆ روبەروی پاشای ئاسمان و زەوی بوویتەوە.

لەم زەمانەدا ژنێك لەشامەوە هاتەلای جەرجیس و ئەو لەژێر خراپترین ئەشکەنجەدا

بوو. ژن پێی وت: جگە لەمانگایەك هیچم نەبوو، لەزەوی کێلانی ئەو ڕۆژیم دەخوارد و مانگاکەم مردار بوویەوە. هاتمە لای تۆ تا بەزەییت بەمندا بێتەوە و لەخوا بپاڕێیتەوە مانگاکەم بۆم زیندوو بکاتەوە. جەرجیس داردەستێکی پێدا و وتی: برۆ لای مانگاکەت و بەم داردەستە لێی دە، بڵێ: بەفەرمانی خوا زیندوو بەرەوە. ژن داردەستەکەی وەرگرت و ڕۆشتە شوێنی مرداربوونی مانگاکە و جگە لەمو و دوو شاخەکەی هیچی نەبینی. ئەوانی کۆکردەوە و دواتر بەداردەستەکە لێیدا و وتەکانی جەرجیسی دووبارە کردەوە. مانگاکە زیندوو بوویەوە.

کاتێك جادووگەر ئەو قسەی کرد، یەکێك لەیاریدەدەرانی پاشا کەدووەمین کەس دوای ئەو بوو، وتی: گوێ لەقسەی من دەگرن. وتیان: بەڵێ. وتی: ئێوە بنەمای کاری ئەم پیاوەتان بەجادووگەرییەوە پەیوەند داوە و ئەو ئەشکەنجەی نەبینی و نەمرد. ئایا هەرگیز جادووگەرێکتان بینیوە مردن لەخۆی دوور و مردوو زیندوو بکاتەوە؟ ئەو داستانی زیندوو بوونەوەی مانگاکەی گێرایەوە. پێیان وت: قسەی تۆ قسەی کەسێکە گوێی لەقسەکانی گرتبێت؟ وتی: باوەڕم پێ هێنا و خوا بەشایەت دەگرم لەوەی دەیپەرستن بێزارم. پاشا و هاوەڵانی بەکێردەکانی خۆیان هێرشیان کردە سەر و زمانیان بڕی و کوشتیان. دەستەیەك دەڵێن: ئەو تاعونی گرت و پاشا مردنەکەی پێش خست و بەنهێنی هێشتیانەوە. جەرجیس بۆ خەڵکی ئاشکرا کرد. ئەو مردبوو کەچوار هەزار کەس باوەڕیان بەجەرجیس هێنا. پاشا هەموویانی بەئەشکەنجەی جۆراوجۆر گرفتار کرد و کوشت.

یەکێك لەهاوڕێ گەورەکانی پاشا وتی: ئەی جەرجیس تۆ گومان دەکەیت خوای تۆ ژیان دەخولقێنێت و مردووەکان زیندوو دەکاتەوە. من داوای شتێك لەتۆ دەکەم ئەگەر خواکەت ئەنجامی بدات باوەڕ بەتۆدێنم و بەڕاستگۆت دەزانم و زیانی ئەم خەڵکە لەتۆ دوور دەکەمەوە. ئێستا لەبەردەم ئێمە چواردە تەخت لەگەڵ سفرە و سینی و قاپی زۆر لەداری وشکە. داوا لەخوا بکە هەموویان وەك سەرەتایان سەوز بکاتەوە تا هەرکام بەرەنگ و گەڵا و گوڵ و میوەکەیان بناسرێنەوە. جەرجیس وتی: داوای کارێکت کرد بۆ من و تۆ دژوار و بۆ خوا ئاسانە. لەخوا پاڕایەوە و ئەوەندەی

نەخایاند هەموویان سەوز بوون و ڕەگەکانیان لەقوڵایی زەوی ڕۆچو و گەڵا و گوڵ و میومیان بەرهێنا بەشێوەیەك خەڵك هەرکامیان بەناو ناسییەوە.

ئەو کەسەی ئەمەی لەجەرجیس داوا کردبوو وتی: ئێستا من کاری ئەشکەنجەدانی جەرجیس لەدەست دەگرم. دواتر تیکەی مسی هێنا و پەیکەری مانگایەکی ناوبەتاڵی لێ دروست کرد و پڕی کرد لەنەوت و گۆگرد و سورب و جەرجیس کردە ناوی و دواتر ئاگری لەژێردا پێ کرد تا گەرم بوو و هەمووشتەکانی ناوی توایەوە و تێکەڵاو بوون و جەرجیس لەناویدا مرد. کاتێك ئەو مرد، خوا گێژەڵوکەیەکی هاورێ لەگەڵ هەورە بروسکە و هەورێکی ڕەش و تاریك نارد و نێوان ئاسمان و زەوی ڕەش و تار کرد و خەڵك بۆ چەند ڕۆژ سەرگەردان بوون. خوا میکاییلی نارد کەپەیکەرەکەی هەڵگرت و بەشێوەیەکی وا کێشای بەزەویدا لەدەنگەکەی هەموو بیسەرانی دەنگەکە تۆقان و ترسان و پەیکەرەکە شکا و جەرجیس ساغ و تەندوروست لەناویەوە هاتەدەر. کاتێك لەسەر پێ وەستا و لەگەڵ ئەوان قسەی کرد، تاریکی لەناوچوو و نێوان ئاسمان و زەوی ڕوناك بوویەوە.

لەم کاتەدا یەکێك لەگەورەکانیان وتی: داوا لەخوا بکە مردووەکانی ئێمە لەم گۆڕستانەدا زیندوو بکاتەوە .جەرجیس فەرمووی تا گۆڕەکان هەڵبدەنەوە کەلەناویاندا ئێسقانە ڕزاوەکان بوون. داوای لەخوا کرد و ئەوەندەی پێ نەچوو ئەوان سەیری حەڤدە کەسیان دەکرد کەزیندوو ببوونەوە: ٩ پیاو، ٥ ژن و ٣ منداڵ. لەناو ئەواندا پیرە پیاوێکی بەتەمەن بوو. جەرجیس لێی پرسی: کەی مردیت؟ وتی: لە فلان ساڵ. ژماردیان و بینیان چوارسەد ساڵە مردووە.

کاتێك پاشا ئەمەی بینی، وتی: ئەشکەنجە نەماوە لەسەر ئەو تاقی نەکەینەوە. ئێستا بەبرسیەتی و تینویەتی ئەشکەنجەی بدەن. ئەوان هاتنە ماڵی پیرێژنێکی هەژار. ئەو کورێکی کوێر و گێژ و پەککەوتەی بوو. ئەویان لەماڵی ئەو ژنەدا زیندانی کرد و ماف خواردن و خواردنەوەیان لێ زەوت کرد. کاتێك برسی بوو بەپیرێژنی وت: ئایا خواردن یا خواردنەوەت هەیە؟ ژن وتی: سوێند بەوەی سوێندی پێ دەخۆن، چەندین ڕۆژە هیچمان نەخواردووە، ئێستا دەڕۆمەدەر و شتێکت بۆ دێنم. جەرجیس وتی: خوا دەپەرەستیت؟ وتی: نە. جەرجیس بۆ خواپەرەستی هانیدا و ئەو باوەڕی هێنا.

ژن رۆشتەدەر تا شتێك بەدەست بێنێت. لەماڵەکەی ئەودا کۆڵەکەیەك (داری وشك) دەبینرا کەسەربانی ماڵەکەی لەسەر جێگیر کرابوو. جەرجیس لەخوا پاڕایەوە، ئەو دارە سەوز بوو و هەموو جۆرەکانی میوەی بەرهەم هێنا. لقەکانی دار لەسەربانەکەوە بەرز بوونەوە و سێبەریان خستە سەر دەوروبەر. پیرێژن هاتەوە و بینی جەرجیس میوەی پاك و تازە دەخوات. کاتێك ئەوی لەماڵەکەیدا رویدا بوو، بینی، وتی: بەو خوایەی لەم شوێنە برسیەدا خواردنی پێدای، باوەڕم هێنا. داوا لەخوا بکە کورەکەم باش بکاتەوە. جەرجیس وتی: بیهێنە بۆ لای من. ژن هێنای. جەرجیس ناوی دەمی لەچاوەکانی سوو کەسۆمایان بەدەست هێنایەوە و فوی کردە گوێچکەکانی و بیستنیان بۆ گەرایەوە. ژن پێی وت: زمان و قاچەکانی بکەرەوە. جەرجیس وتی: ئەمە دوابخە چوونکە ئەو رۆژێکی گەورەی لەپێشە.

پاشا دارەکەی بینی و وتی: دارێك دەبینم پێشتر نەمبینیبوو. وتیان: هی جادووگەرە کەویستت بەبرسیەتی و تینویەتی ئەشکەنجەی بدەیت. ئەم دارەی بۆ رواوە. ئەو خۆی تێر و پیرێژنەکەیشی تێر کردووە و تەندروستی بەکورەکەی بەخشیوە.

پاشا فەرمانیدا ماڵەکەیان وێران کرد و وتی دارەکە ببڕن. کاتێك ویستیان بیبڕن، خوا وشکی کرد و ئەوان بەجێیان هێشت. فەرمانیدا جەرجیسیان لەسەر زەوی راکێشا و وتی عارەبانییەك بێنن و ستونێکی قورسی بخەنەسەر و لەژێر عارەبانەکە گێرد و شمشێریان دانا. دواتر چل مانگای نێریان پێوە بەست کە بەیەکجار رایان دەکێشا و جەرجیس کە لەژێریدا بوو، بوو بەسێ لەت. فەرمانیدا لەتێکیان سوتاند و کردیانە خۆڵەمێش و خۆڵەمێشەکەی بەچەند پیاوێکدا نارد و خستیانە دەریا. ئەوەندەی پێنەچوو، دەنگێکیان لەئاسمانەوە بیست کەدەیوت: ئەی دەریا، خوا فەرمانت پێ دەدات ئەو ئەندازە لەم پەیکەرە کە پاك و خاوێن لەسەر تۆیە، بپارێزیت چوونکە من دەمەوێت بیگەرێنمەوە. خوا بای نارد و کۆی کردەوە. بەشێوەیەك پێش پرژاندنە ناو دەریا، کەسەکان هێشتا لەوێ بوون و نەرۆشتبوون، جەرجیس زیندوو تۆزی لەخۆی تەکاند و هەستا. ئەو لەگەڵ ئەوان گەرایەوە. باسی دەنگ و بایان بۆ پاشا گێرایەوە. پاشا پێی وت: ئایا کارێك دەکەیت بۆمن و تۆ باشتر بێت؟ ئەگەر بەو شێوە نەدەبوو کەدەیانوت بەسەر مندا زاڵ بوویت، باوەرم بەتۆ دەهێنا بەڵام تۆ

یەکجار لەبەردەم بتەکەی من سەر لەزەوی بسوو یا مەڕێك بکەرە قوربانی و من کارێك دەکەم تۆ شادمان بیت. جەرجیس بیری لە لەناوبردنی بتەکە کردەوە و ئەمە کاتێك روودەدات کەبتەکە ببینێت و ببینێت پاشا باوەری بەخوا هێناوە. لەم رووەوە وەك فێڵ، وتی: دەیکەم. من ببە لای بتەکەی خۆت تا نوێژی بۆ ببەم و مەڕێکی بۆ سەر ببڕم.

پاشا لەم وتە شادمان و دەست و پێی ماچ کرد و داوای لێکرد بۆ شەو و رۆژێك لای بمێنێتەوە. جەرجیس ئەو کارەی کرد. پاشا ماڵێکی خاڵی بۆ دروست کرد و جەرجیس لەوێدا مایەوە. کاتێك شەو داهات، بۆ نوێژ هەستا و زەبوری دەخوێند. دەنگی خۆشی بوو. کاتێك شاژن ئەمەی بیست، باوەری هێنا و باوەری خۆی شاردەوە. کاتێك بەیانی بوویەوە ئەویان بردە بتخانە تا نوێژ بۆ بتەکە ببات.

لەولا بەپیرێژنیان وت جەرجیس هەڵخەڵەتاوە و چاوی تەماحی تێبڕیوە تادوای پاشا بەپاشایەتی بگات. ئەو کورەکەی خستە سەرشان و بەدەم جنێودان بەوان و سەرکۆنە کردنی جەرجیس بەرێکەوت. کاتێك رۆشتە ناو بتخانە، بینی پیرێژن و کورەکەی لەهەمووان بەو نزیکترن. جەرجیس کورەکەی بانگ کرد و ئەو وەلامی دایەوە و پێشتر هیچ قسەیەکی نەکردبوو. دواتر لەکۆڵی دایکی هاتەخوار و بەهەنگاوی بەهێز بەرێکەوت و پێشتر قاچی بەزەوی نەگەشتبوو. کاتێك لەبەردەم جەرجیس وەستا، پێی وت: ئەم بتانە بۆمن بانگ بکە. ئەوان حەفتا و یەك بت لەسەر تەختی زێرین بوون. ئەو خەڵکە خۆر و مانگیان لەگەڵ ئەواندا دەپەرست. ئەوانی بانگ کرد وبتەکان بەرەو لای تلان و کاتێك گەشتنە لای، قاچی لەزەویدا تا لەگەڵ تەختە زێرینەکانیان قوتیان بدات. پاشا وتی: ئەی جەرجیس فێڵت لەمن کرد و بتەکانی منت لەناو برد. جەرجیس وتی: ئەم کارەم بەخواستی پێشتری خۆم کرد تا پەند وەربگریت و بزانیت ئەگەر خوا بوونایە خۆیان لەزیانی من دەپاراست. کاتێك ئەمەی وت: شاژن کەوتە قسە و خوا پەرستی خۆی ئاشکرا کرد و کارە چاك و مۆجیزە ئاساکانی جەرجیسی ناوبرد و وتی: لەم پیاوە جگە لەمە چاوەروان نەدەکرا کەیەك جار داوا لە خوا بکات و هەمووتان لەگەڵ بتەکانتان لەناو ببات. پاشا وتی: چەندە زوو ئەم جادووگەرە تۆی فریودا. فەرمانیدا: شاژنیان لەداردا و ئەوسا گۆشتی

جەستەی ئەویان بەشانە ئاسنینەکان داتاشی. کاتێك ئەشکەنجەی بینی داوای لەجەرجیس کرد لەخوا بپارێتەوە ئازارەکانی کەم بکاتەوە. جەرجیس وتی: سەیری سەرسەری خۆت بکە. شاژن سەیری کرد و پێکەنی. پاشا وتی: تۆ بەچی پێدەکەنیت؟ وتی: لەسەر سەرم دوو فریشتە بە تاجێکی رازاوە بەزێرەکانی بەهەشت دەبینم کەچاوەروانی رۆشتنە دەرەوەی رۆح لەجەستەم دەکەن تا بمرازێننەوە و بۆ بەهەشتم ببەن. کاتێك شاژن مرد، جەرجیس لەخوا پارایەوە وتی: خوایە بەم تاقی کردنەوە رێزت لەمن گرت تا باشترین شوێنی گیانبازانم پێ ببەخشیت. ئەمە دوایین رۆژەکانی منە. داوا لەتۆ دەکەم لەرق و تووڕەیی خۆت ئەشکەنجەیەك بۆ سەر ئەم ناباوەرانە بنێریت کەتوانای بەرگە گرتنیان نەبێت. خوا ئاگری بۆناردن و هەموویانی سوتاند. کاتێك ئاگریان تێبەربوو، بەشمشێرەکانی خۆیان هێرشیان کردە سەر جەرجیس و خوێنیان رشت. ئەمە چوارەمین مەرگ بوو. کاتێك شار بەهەموو خەڵکان و هەموو شتەکانی سوتا، بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە و ژێر و روو بوو. تا رۆژگارێك دووکەڵ لەژێریەوە دەهاتەدەر.

هەموو ئەو کەسانەی باوەریان پێهێنا، هاورێ لەگەڵ شاژن سی و چوار هەزار کەس بوون.

## داستانی خالید کوڕی سنان عەبەسی

لەناوئەم کەسانەی لەم ڕۆژگارەدابوو خالید کوڕی سنانی عەبەسی بوو.
دەستەیەك دەڵێن: ئەو پێغەمبەر ویەکێك لەموٚجیزەکانی ئەوە بوو ئاگرێك لەسەرزەمینی عەرەبەکان دەرکەوت و خەڵك شەیدای بوون و نزیك بوونەوە لەئاگر پەرستی. خالید ڕۆشت و داردەستێکی هەڵگرت و کاتێك گەشتە ناوی پرژ و بلاٌوی کردەوە. ئەو دەیوت: پرژو بلاٌوبە، پرژو بلاٌو بە. هەر ڕێنوێنی کردنێك لەخوای ڕێنوێنیکەرە. دەرۆمە ناو ئەم ئاگرە کە بڵێسە دەکێشێت و لێی دێمەدەر کە ئاو لەجلەکانم بچۆڕێت. ئەو لەناویدابوو ئاگرەکە کوژایەوە.

کاتێك ڕۆژگاری مردنی گەشت، بەکەسەکانی خۆی وت: کاتێك بەخاك سپێردرام، گایەلێك لەمانگا کێوی و دەشتییەکان لەحەمیر دێت و لەپێشیانەوە گەرێکی وەحشی کلك بڕاوە وگۆرەکەی من بەسمی خۆی دەشێلێت. کاتێك ئەمەی کرد گۆرەکەی من هەڵبدەنەوە تا هەموو بەسەرهاتەکانی داهاتوو بەئێوە بڵێم. کاتێك مرد، بەوشێوەی لێهات کەوتبووی. ویستیان گۆرەکەی هەڵبدەنەوە بەلاٌم تاقمێك ئەم کارەیان پێ ناخۆش بوو و وتیان: دەترسین ئەگەر گۆرەکەی هەڵبدەینەوە، عەرەبەکان جنێومان پێبدەن و بڵێن گۆری مردووەکانی خۆیان هەڵدەدەنەوە. ئەو کارەیان نەکرد.

دەڵێن پێغەمبەر(د.خ) لەبارەی ئەو فەرموویەتی: ئەو پێغەمبەرێك بوو خەڵکەکەی ڕێزیان نەگرت و سوکیان کرد. کچەکەی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەری هێنا.
بەمشێوەیان وتووە کەژیانی ئەو لەکۆتایی ڕۆژگاری پاشای تیرەکان بووە. ئەمە ڕاست نییە چوونکە کەسێك کچەکەی پێغەمبەری ببینێت، ڕۆژگارێکی درێژ دوای هاتنە سەرتەختی ئەردەشیر کوری بابەکە.
ئێستا ئاماژە بەمێژووی پاشاکانی ئێران دەدەین و لەناو پاشای تیرەکان، بەخواستی خوای گەورە، ئاماژە بەئەشکانیان دەدەین. دواترچینەکانی پاشاکانی ئێران دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

## چینەکانی پاشاکانی ئێران

## چینی یەکەم:

## پیشدادییەکان

پاشاکانی سەر زەوی دوای کیومەرس بریتی بوون لە: ئەوشهەنج(هوشەنگ) پیشدادی چل ساڵ (پیشداد بەمانای یەکەم داوەر و یەکەم دادیارە)، تەهمورس کوڕی یونجهان سی ساڵ، براکەی جەمشید حەوسەد و شانزە ساڵ، بیوراسف کوڕی ئەروانداسف هەزار ساڵ، فەرەیدون کوڕی ئاسغیان (ئاتبین) پێنسەد ساڵ، مەنوچێهر سەد و بیست ساڵ، ئەفراسیابی تورك دوانزە ساڵ، زو کوڕی تەهماسف سی ساڵ و گرشاسپ نۆ ساڵ.

## چینی دووەم:
## کیانییەکان

پاشاکانی کیانی ئەمانە بوون و بەم شێوە فەرمانڕەوایەتیان کرد: کەیقوباد دووسەد و بیست و شەش ساڵ (٢٢٦)، کەیکاووس سەد و پەنجا ساڵ(١٥٠)، کەیخوسرەو هەشتا ساڵ (٨٠)، کەی لهراسب سەد و بیست ساڵ (١٢٠)، کەی بشتاسب سەد و بیست ساڵ(١٢٠)، کەی بەهمەن سەد و دوانزە ساڵ(١١٢)، خەمانا چێهر ئازاد سی ساڵ (٣٠)، براکەی دارا کوڕی بەهمەن دوانزە ساڵ(١٢)، گورەکەی دارا کوڕی دارا چواردە ساڵ (١٤). ئەو ئەو کەسە بوو ئەسکەندەر پاشایەتی لێسەند. پاشایەتی ئەسکەندەر دوای ئەو چواردە ساڵ بوو.

## چینی سێیەم:

## ئەشغانییە (ئەشکانییەکان)

ئەو پاشایانە بوون بەسەر عێراق و کێوەکاندا زاڵ بوون و پاشاکانیتری تیرەکان ئەوانیان بەگەورە دەزانی. یەکەم پاشای ئەشکانی لەرۆژگاری پاشای تیرەکان ئەشك بوو کەپەنجاو دوو ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. کەسانیتر دوای ئەو بەم شێوە فەرمانروایەتیان کرد:

کورەکەی شاپوور کوڕی ئەشك بیست و چوار ساڵ، کورەکەی گودەرز کوڕی شاپور کەدوای کوژرانی یەحیا کوڕی زەکەریا لەگەڵ ئیسرائیلیەکان شەڕی کرد، پەنجا ساڵ، کوڕی براکەی وەبجن کوڕی لاش بیست و یەك ساڵ، گودەرز کوڕی وەبجن نۆزدە ساڵ، براکەی نێرسی سی ساڵ، مامی هورموزان کوڕی بلاش کوڕی شاپوور نۆزدە ساڵ، کورەکەی فیروز کوڕی هورموزان دوانزە ساڵ، کورەکەی خوسرەو چل ساڵ، براکەی بلاش کوڕی فیروز چواردە ساڵ، کورەکەی ئەردەوان کوڕی بلاش پەنجا و پێنج ساڵ و بەوتەی هەندێ کەس ئەردەوانی گەورە دوانزە ساڵ.

لەبارەی ژمارەی پاشاکانی تیرەکان ئاماژەیان بەپێرستێکی تر جیاواز لەمەداوە. ئەم وتەیە لەبارەی نێرانییەکان ناشکرایە کەپاشایەتییان لەرۆژگاری پاشای تیرەکان، پاشایەتی بیوراسف و پاشایەتی ئەفراسیاب شڵەژابوو چوونکە فەرمانرەوایەتی لەدەست ئەواندا نەما و بەهێزکردنەوەی لەتوانای ئەواندا نەبوو.

## چینی چوارەم:
## ساسانییەکان

ئەم بنەماڵەیە ئەردەشیر کوڕی بابەك دایمەزراند.

### بەسەرهاتی ئەردەشیر کوڕی بابەك و پاشاکانی ئێران

دەڵێن: کاتێك لەزاڵبوونی ئەسکەندەر بەسەر سەرزەمین بابل، بەوتەی مەسیحییەکان و خاوەنانی کتێبە یەکمینەکان پێنسەد و بیست و سێ ساڵ (٥٢٣) و بەوتەی ئاگر پەرستەکان دووسەد و شەست و شەش ساڵ (٢٦٦) تێپەری کرد، ئەردەشیر کوڕی بابەك کوڕی سانی بچوك کوری بابەك کوڕی ساسان کوڕی بابەك کوڕی مهرمس کوڕی ساسان کوڕی بەهمەن کوڕی شا ئەسفەندیار کوڕی بشتاسب، هەستا بەتۆڵە سەندنەوەی پاشا دارا کوڕی دارا و پاشایەتی بۆ کەسەکانی خۆی گەڕاندەوە بەو شێوەی بەردەوام لەکۆنەوە پێشینیانیان پێش هاتنی پاشای تیرەکان بوون.

ئەو پاشایەتی بەسەرۆکێکی تاقانە سپارد کە بەتەنیایی بەسەر سەراسەری خاکی زێرینی ئێران فەرمانرەوایەتی دەکرد.

دەڵێن زادگای ئەو دێهاتێك لەدێهاتەکانی ئیستەخر بوو کە پێیان دەوت تیزودە و بەیەکێك لەدێهاتەکانی شاری ئیستەخر هەژمار دەکرا. باوەپیارەی ئەو ساسان

پیاوێکی ئازا و شەیدایی ڕاو بوو. ئەو لەگەڵ ژنێك لەنەژادی پاشاکانی ئێران بەناوی بازرنگیان پەیوەندی هاوسەری بەست. ئەو ئاگرداری ئاتەشکەدەی ئیستەخر بەناوی نارهید (ئاناهید، ناهید، ئاناهیتا) بوو. ئەم ژنە بۆ ئەو بابەکی هێنایە دنیا. کاتێك گەورە بوو، دوای باوك، فەرمانرەوایەتی خەڵکەکەی خۆی کرد. ئەو کاتە بۆ ئەو کورەکەی ئەردەشیر لەدایك بوو. پاشای ئیستەخر لەم کاتەدا یەکێك لەبازرەنگیان بەناوی جوزهێر (گوچهیر) بوو. پیاوێکی خەساو بەناو تیری (بتری) سەرۆکی غولامەکان کەکردبوویەوە ئەرگبان (یانی پاسەوانی ئەرگ و دەرباری شایی) لەدارابگەرد. کاتێك حەوت ساڵ لەژیانی ئەردەشیر تێپەری، باوکی هێنایە لای جوزهێر و داوای لێکرد بیسپێریت بەتیری تا بەجوانی پەروەردەی بکات و دوای ئەو ئەرگبانی ئەوێ بێت. ئەو فەرمانی برد و ئەردەشیری بەتیری سپارد. تیری ئەوی وەرگرت و هاوشێوەی کورەکەی خۆی پەروەردەی کرد. کاتێك تیری مرد، ئەردەشیر بەڕێوبردنی کارەکانی گرتە دەست و بەباشی هەڵیسوراند. دەستەیەك لەئەستێرەناسەکان ئاگاداریان کردەوە لەکاتێکی پیرۆزدا لەدایك بووە و لەبەر ئەمە دەبێتە پاشای سەرزەمین. گیانی و ڕۆحی بەرادەیەك بەهێز بوو کە پێشتر هاوشێوەی نەدەبینرا. یەکەم کار کردی ئەوە بوو ڕۆشتە شوێنێك لەدارابگەرد بەناوی خوبابان(جوبابان) و پاشاکەی بەناوی فاسین(قاسین، کاسین) کوشت و دواتر ڕۆشتە شوێنێك بەناوی کوسەن (کونس) و پاشاکەی کوشت کەناوی مەنوچێهر بوو. دواتر ڕۆشتە شوێنێك بەناوی لەزویر(رویر) و لەگەڵ پاشای ئەوان دارا هەمان کاری کرد. ئەو لەهەر شوێنێك یەکێك لەکەسەکانی خۆی دادەنا. بۆ باوکی نوسی چی کردووە و فەرمانی پێدا دژی جوزهێر ڕاپەڕێت. باوکی لەم کاتەدا لەبەیزا بوو. ئەو ڕاپەری و جوزهێری کوشت و تاجی لێسەند و بۆ ئەردەوان پاشای کێوەکان و دوروبەری نامەی نوسی و بەگریانەوە داوای لێکرد تاجی جوزهێر بەکورەکەی ئەو شاپوور بسپێرێت و ئەو لەسەرتەختی پاشایەتی دابنێت. ئەردەوان بەم داوایە ڕازی نەبوو و ئەوی ئاگادار کردەوە. بابەك گوێرایەڵی نەبوو و لەماوەی سێ ڕۆژدا لەناوچوو.

لەمکاتەدا کورەکەی شاپوور کوڕی بابەك تاجی لەسەرنا و لەجێگەی باوکی لەسەر تەخت دانیشت. ئەو نامەی بۆ ئەردەشیر نوسی و بانگی کرد. ئەردەشیر ڕازی نەبوو و

ئەرۆشت. شاپپور تورە بوو و سوپای کۆکردەوە و بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت. لەشاری ئیستەخر کەتیایدا دەستەیەك لەهاورێکان و برا و کەسەکانی دەژیان و کەسانی گەورەتریش لەوێ ژیانیان بەسەردەبرد، هاتەدەر. تاج و تەختیان لێ ستاند و بۆ ئەردەشیریان گەڕاندەوە. ئەو تاجی لەسەرنا و بەهەوڵدان و توانایی و بەهێزی دەستپێکرد و بۆ خۆی وەزیرێکی دیاری کرد. زۆری نەخایاند زانی برا و کەسەکانی دەیانەوێت بیکوژن. لەبەر ئەمە ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. لەم کاتەدا دانیشتوانی دارابگەرد دژی راپەرین. بۆ دارابەگەرد گەرایەوە و ژمارەیەکی لەخەڵکەکەی کوشت. دواتر رۆشتە کرمان کەپاشایەك بەناوی بلاش فەرمانرەوایەتی دەکرد. شەڕێکی قورس رویدا. ئەردەشیر خۆی بەگیان هەوڵیدا و بلاشی دیل کرد و دەستی بەسەر شاردا گرت و کورکەی خۆی (کە ئەویش بەئەردەشیر ناودەبرا) کردە فەرمانرەوایی ئەوێ.

لەقەراغەکانی دەریایی فارس پاشایەك بەناوی ئەسیون (ئەسبوون، ئەسنون) فەرمانرەوایەتی دەکرد کەئەویان بەگەورە دەزانی. ئەردەشیر مەبەستی ئەوی کرد و خۆی و هاورێکانی کوشت و سامانێکی زۆری بەتالان برد.

نامەی بۆ پاشای زۆر نوسی و ئەوانی بۆ فەرمانبردن لەخۆی هاندا. یەکێك لەوان مێهرەك فەرمانرەوای ئەبرساس (ئیراسستان) ئەنەردەشیرخەرە بوو. ئەوان ملکەچی فەرمانرەوایەتی ئەو نەبوون. بەمەبەستی شەڕ لەگەڵ مێهرەك هاتەدەر و بەرەوەلای ئەو بەرێکەوت و کوشتی و دواتر رۆشتە جوور(گوور) و ئەوێی بنیات نا و کۆشکی ناوداری بەناوی تەربال (توبال) و ئاتەشکەدەیەکی دروست کرد.

لەم کاتەدا نێردراوێك لەلایەن ئەردەوانەوە هات و نامەی هێنا. ئەو خەڵکی کۆکردەوە و نامەکەی بۆ خوێندنەوە. لەنامەکەدا نوسرابوو: ئەی پیاوی بەرەچەڵەك کورد، تۆ پێت زیاتر لەبەڕەکەی خۆت درێژ کرد و مەرگت بەسەر خۆتدا هێنا. کێ تاج و تەختی وڵاتی بەتۆ سپاردووە؟ کێ بەتۆی فەرمووە شار بنیات بنێیت؟ لەنامەکەدا

نوسرابوو من پاشای ئەهوازم نارد تا تۆ بگرێت و بەدەست بەستراوی بتهێنێت بۆ لای من.

ئەردەشیری بۆی نوسی: تاج و تەخت خوا بەمنی بەخشی و هیوادرام خوا من بەسەر تۆدا زاڵ بکات تا سەرت بکەمە پێشکەشی بۆ ئەو ئاتەشکەدەی خۆم بنیاتم ناوە.

ئەدەشیر بەرەو ئیستەخر بەرێکەوت و ئەبرسام وەزیرەکەی خۆی لەئەردەشیرخەرە لەجێگەی خۆی دانا. زۆری نەخایاند نامەی ئەبرسام گەشت کەباسی هاتنی پاشای ئەهواز و شکان وگەڕانەوەی ئەوی دەکرد.

ئەردەشیر دوای ئەوە رۆشتە ئیسفەهان و دەستی بەسەردا گرت و پاشاکەی کوشت و بۆ فارس گەرایەوە و رویکردە شەڕی نیروفەر (نیروکەر، بیروفەر) فەرمانرەوای ئەهواز. دواتر رۆشتە ئەرجان و میسان و تاسار و ئەوسا رۆشتە سرق و لەقەراغ دجیل مایەوە و دەستی بەسەر شاردا گرت و شاری سوق الاهواز( بازاری ئەهوازی) بنیات نا و لەگەڵ تالآنییەکان بۆ فارس گەرایەوە. ئەوسا لەرێگەی خەرە و کازەرون بۆ ئەهواز گەرایەوە و پاشای میسانی کوشت و کەرخی میسانی بنیات نا و بۆ فارس گەرایەوە.

نامەی بۆ ئەردەوان نوسی و ئاگاداری کردەوە دەیەوێت لەگەڵ ئەودا شەڕ بکات و داوای لێدەکات شوێنێك بۆ روبەروبوونەوە ئامادە بکات. ئەردەوان لەوەڵامدا نووسی: لەکۆتایی مانگی مێهر لەدەشتی هورموزگان چاوم بەتۆ دەکەوێت. ئەردەشیر پێش کاتی دیاریکراو رۆشتە ئەوێ و خەندەقی هەڵکەند و پڕی کرد لەئاو و شوێنی لەشکەرەکەی خۆی بەهێز کرد. ئەردەوان لەگەڵ پاشای ئەرمەنییەکان هاتە ئەوێ. ئەم دووانە لەسەر پاشایەتی دژایەتی یەکیان دەکرد بەڵام ئێستا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەردەشیر یەکیان گرتبوو. شەڕ دەستی پێکرد و ئەوان پشتیان نا بەپشتی یەکەوە و روبەروی وەستانەوە بەشێوەیەك ئەمرۆ یەکیان شەڕی لەگەڵ دەکرد و سبەی یەکیتریان. رۆژێك کەوادەی شەڕ لەگەڵ پاشای ئەرمەنییەکان بوو، ئەردەشیر بەرگەی نەدەگرت و رۆژێك کەوادەی شەر لەگەڵ ئەردوان بوو، ئەو بەرگەی نەدەگرت. لەم کاتەدا ئەردەشیر لەگەڵ بابا پاشای ئەرمەنییەکان پەیمانی ئاشتی بەست و داوای

لێکرد دەست لەو هەڵگرێت تا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەردەوان دەستی کراوە بێت. ئەوەندەی نەخایاند ئەردەشیر شکەستی دا و بەسەر وڵاتەکەی ئەودا زاڵ و بابا ملکەچی بوو. لەم کاتەوە ئەردەشیریان بەشاهەنشا یانی شای شاکان ناوبرد.

دواتر رویکردە هەمەدان و دەستی بەسەردا گرت. ئەو کات رویکردە کێوەکان و ئازەربایەجان و ئەرمەنستان و موسڵ و دەروازەکانی ئەو شوێنانەی بەزۆری شمشێر کردەوە. دوای موسڵ رۆشتە سواد و گرتی و لەسەر قەراغ دیجلە بەرامبەر بەتیسفون شارێکی دروست کرد کە لەرۆژهەڵاتی مەداینە و شارێکی رۆژئاواییە. ئەو بەناوی خۆی ناوی نا ئەردەشیر. لەسواد هاتە ئیستەخر و لەوێوە رۆشتە سیستان و دواتر گورگان و ئەوسا نەیشابوور، مەرو، بەلخ و خوارەزم. لەوێ هاتە فارس و لەگور مایەوە. لێرەبوو نامەی پاشاکانی کوسان و توران و مەکرانی بەدەست گەشت و هەموویان ملکەچی خۆیان نیشاندا.
دواتر لەگوور بەرەو بەحرەین رۆشت و پاشای ئەوێ ناچار بوو خۆی لەدیواری قەڵاکەوە فرێبدات. ئەوسا گەرایەوە بۆ مەداین و لەژیانی خۆیدا تاجی بەخشی بەکورەکەی خۆی شاپوور. ئەو هەشت شاری دروست کرد: خەت لەبەحرەین، بێهرسیر لەبەرامبەر مەداین کەناوەکەی لەناوی خۆی وەرگیراوە و بەنەردەشیر ناودەبرا و دواتر بۆ بێهرسیر کورتبوویەوە. ئەردەشیرە کەشاری فیروزئابادە و عضد الدولە کوڕی بوویە ئەم ناوەی لێنا. هەروەها شاری ئەردەشیر لەکرمان کەدواتر بۆ ناوی بۆردشیر گۆڕا. بەهەمەنی ئەردەشیر لەقەراغ دیجلە لەنزیکی بەسرە کە بەسرەییەکان بەبەهمەن شیر ناوی دەبەن، فوراتی میسان، رامهۆرمۆز لەخوزستان، سوق الاهواز (بازاری ئەهواز) و بوودەری ئەردەشیر کەهەمان خەرمیە و ئەمانە هەمووی نۆ شارن.

ئەردەشیر بەردەوام سەرکەوتوو و راست کردار بوو و هیچ کات ئاڵاکەی ژێر نەکەوت و دانەگیرا. چەندین شاری بنیات نا و پایەکان و پێگەکان و بنەماکانی فەرمانرەوایی وڵات و فەرماندەیی لەشکر و پیشەوەران و ئاینی ساماندا و شارەکانی ئاوەدان کردەوە.

رۆژگاری پاشایەتی ئەو لەو کاتەوەی ئەردەوانی کوشت، چوارده ساڵ یا بیست و چوار ساڵ بوو. کاتێك ئەردەشیر بەسەر عێراقدا زاڵبوو، زۆربەی هۆزە نیشتەجێ بووەکان لەوێ ملکەچی فەرمانەکانی نەبوون و مانەوە لەولاتیان پەسەند نەکرد و لەم روەوە هۆزی قوزاعە رۆشتنە شام بەلام دانیشتوانی ئەنبار و حیرە ملکەچی بوون. ئەم دوو شارە لەسەردەمی بخت النسر دروست کرابوون. حیرە وێران و خەڵکەکەی هاتنە ئەنبار. ئەنبار بۆ ماوەی پێنسەد و پەنجا ساڵ (٥٥٠) ئاوەدان بوو تا ئەوی حیرە لەسەرددمی عەمرۆ کوڕی عودەی ئاوەدان بوویەوە و پێنسەد وسی چەند ساڵ ئاوەدان بوو تا ئەوەی لەرۆژگاری ئیسلامی شاری کوفە دروست کرا و ئیسلامیەکان هاتنە ئەوێ و لەوێ نیشتەجێ بوون و مانەوە.

# پێڕست

## شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەك

کاتێك ئەردەشێر کوڕی بابەك مرد، کورەکەی شاپور لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. ئەردەشێر لەکوشتنی ئەشکانییەکان سنوری بەزاند. بۆ لەناو بردنی ئەوان قۆڵی هەڵکرد. هۆکاری ئەم کارە سوێندی باوەپیارەی، ساسان بوو کە: ئەگەر رۆژێك فەرمانڕەوایەتی بگرێتەدەست، لەنەژادی ئەشك کوڕی حەرە یەك کەس بەزیندووی ناهێڵێتەوە. ئەم سوێندەی لەسەر کورەکان و پاشاکانی داهاتووی ئێران کردە فەرمانێکی پێویست. یەکەم کەس لەبنەماڵەی ئەو کە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، ئەردەشێر بووە کە هەموو ئەشکانییەکانی بەپیاو و ژن لەتیغی شمشێر گوزەراند. جگە لەکچێکی جوان لەپاشا کوژراوەکان کەلەپایتەخت بینی و شەیدای بوو. ئەو لەنەژادەکەی پرسی و کچ وتی پەرەستاری یەکێك لەهاوسەرانی پاشایە. لێی پرسی کچە یا مێردی بینیوە. وتی: کچم. ئەردەشێر ئەوی وە کوڕی هاوسەر هەڵبژارد و لەهەمان کات نزیکی لەگەڵ کرد و کچ دووگیان بوو.

کاتێك زانی لەپاشا سکی پڕبووە و ناکوژرێت، لەنەژادی خۆی ئاگاداری کردەوە (کەکچی ئەشکە). پاشا لێی سڵەمیەوە و هێرجەد کوڕی ئەسامی بانگ کرد کەپیرەپیاوێکی بەتەمەن بوو. لەراستی روداوەکە ئاگاداری کردەوە و فەرمانی پێدا، ژنەکە بکوژێت تا سوێندی باووباپیرانی بەجێبێنێت. پیرەپیاو کچی برد بۆ ئەوەی بیکوژێت بەڵام کچ لەدوو گیانی خۆی لەپاشا ئاگاداری کردەوەکردەوە. هێرجەد پەرەستارەکانی بۆ ئەوەی راستیی وتەکانی ئەوی بۆ دەرکەوێت و مامانەکان جەختیان لەسەر دووگیانی ئەو کردەوە. پیرەپیاو ئەو ژنە جوانەی بردە ژێرزەمینێك و دواتر عەورەتی خۆی بڕی و خستییە ناو کیسەیەك و مۆری کرد و هاتە لای پاشا. پاشا پرسی: چیت کرد؟ پیرەپیاو وتی: ئەوم خستە ژێر زەوی. ئەوسا پیرەپیاو کیسەکەی تەسلیم بەپاشا کرد و داوای کرد مۆری خۆی لێبدات و بەگەنجینەی بسپێرێت. پاشا ئەو کارەی کرد.

ئەو کچە، کوڕیکی هێنایە دنیا. پیرەپیاو پەسەندی نەکرد ناوێکی نزمتری لەپاشای لێ بنێت. هەروەها ترسا لەمناڵییەوە ئەم نهێنییەی لا بدرکێنێت. لەبەر

ئەوە، ئەستێرەی ئەوی بانگ کرد و ژماردی و ئەوی ناونا شاپوور (شاهپور، شاهزادە) کە هەم ناو بێت و هەم نیشان. یەکەم کەس بوو بەم ناوە بانگ کرا.

ئەردەشیر مایەوە و منالی نەبوو. رۆژێك پیرەپیاو کە ئەو منالە (شاپوور) لای ئەو بوو، هاتە لای ئەردەشیر و ئەوی بەخەمبار بینی. پرسی: پاشا چ خەمێکی هەیە؟ ئەردەشیر وتی: بە شمیشێری خۆم هێرشم کردە سەر رۆژ ئاوا و رۆژ هەلآت و سەرکەوتم بەشێوەیەك پاشایەتی باوکانم بۆمن بەهێز و سەقامگیر بوو. ئێستا دەمرم و منالم نییە. پیرەپیاو پێی وت: پاشا، خوا پایەدارت بکات! تۆ لای من کوڕیکی پاك و گرانبەهات هەیە. ئەو کیسەی لای تۆ دامنا، بیهێنە تا نیشانییەکەی نیشانی تۆ بدەم. ئەردەشیر کیسەکەی هێنا و کردیەوە. عەورەتی پیرەپیاوەکە و نامەیەکی تیا بینی. نوسرابوو: کاتێك کچی ئەشك ئاگاداری کردمەوە لەپاشا دووگیانە و شای شاکان فەرمانی دابوو بیکوژم، بەرەوام نەزانی ئەو منالە پاکەی پاشا لەناو ببەم. بەهەمان شێوە کەفەرمانتان دابوو، بەژێرخاکم سپارد (بردمە ژێر زەمین و لەوێدا هێشتمەوە). خۆیشمان بەشێوەیەك پاك کردەوە تا هیچ زیانێك نەتوانێت ئەو مانگ روخسارە بگەزێت( نەتوانێت تاوان بۆ ئەو هەڵبەستێت یا تەمای تێبکات). ئەردەشیر فەرمانیدا لەگەڵ شاپوور سەد کور(بەوتەی دەستەیەك کەس هەزار کوڕ) لەهاوتەمن و هاوشێوەکانی ئەو لەپەیکەر و ئەندام کۆبکەنەوە و دواتر هەموویان برۆنە لای و هیچ نیشان یا جل و بەرگێك ئەوان لەیەك جیا نەکاتەوە. پیرەپیاو ئەو کارەی کرد. کاتێك ئەردەشیر سەیری کرد، لەناویاندا کورەکەی خۆی ناسییەوە. ئەوسا گۆی و چەوگانیان پێدان تاگەمە بکەن. پاشا لەهەیوان دانیشتبوو. گۆی کەوتە ناو هەیوانەکە و کوڕەکان نەیاندەوێرا برۆن و بیهێننەوە. لەناو ئەوان شاپوور هەنگاوی بردە پێش و رۆشتە ناو هەیوانی پاشا. ئەردەشیر لەبوێری ئەو هەستی بەنەژادی ئەو کرد. زانی کورەکەیەتی. پرسی: ناوت چییە؟ وتی : شاپوور.

کاتێك کوڕەکەی بینی لەناو خەڵکان ئاشکرای کرد و تاجی پێ بەخشی.

ئەو پیاوێکی بیرمەند و قسەزان و فرەزان بوو. کاتێك پاشا مرد و تاجی خستەسەر، سامانەکانی لەنێوان خەڵکانی دوور و نزیك دابەش کرد و لەگەڵ ئەواندا

هەڵس و کەوتی باشەی گرتەبەر. کردەوە باشەکانی ئەو دەرکەوت و بوو بەسەروەری هەموو پاشاکان. ئەو شاری نەیشابور و شاری شاپوور (ئەمیان لە فارس) و فیروز شاپوور — لەئەنبار- و جوندی شاپووری دروست کرد.

دەڵێن: بۆ ماوەیەك لەنەصیبین گەمارۆی خستە سەر رۆمیەکانی. لەم کاتەدا لەپانتایی خوراسانەوە هەواڵێکی بەدەست گەیشت کەپێویست بوو خۆی بۆ چارەسەر کردنی بڕوات. رۆشت و ئارامی بۆ ئەو ناوچە گێرایەوە، دواتر گەرایەوە نەصیبین و دوبارە گەمارۆیدا. دەڵێن دیواری شارەکە لەبەرابەر ئەو دارما و کەلێنێك دروست بوو و لەوێوە رۆشتە ناوشار. زۆری کوشت و تالآنی زۆری کرد. دواتر رویکردە شارەکانی شام و دەستی بەسەر زۆربەیاندا گرت کەلەناویاندا فالوقیە و قدوقیە (قالونیە و قودقیە)دەبینران. لەشاری ئەنتاکیە گەمارۆی خستە سەر پاشای رۆم و دیلی کرد و هاورێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر، ئەوانی هێنا بۆ ئێران لەجوندی شاپوور نیشتەجێی کردن.

## داستانی شاری حزر

لەکوێستانی تکریت لەنێوان فورات و دیجلە شارێك بوو پێیان دەوت حزر و پاشایەك کە بەساتروون ناویان دەبرد. ئەو لەجەرمەقیان(جەرامیقە)بوو. عەرەبەکان پێی دەڵێن ضیزن. ئەو لەهۆزی قوزاعە بوو. بەسەر دورگەکەدا فەرمانرەوایەتی دەکرد و سوپای زۆری کۆکردبوویەوە. کاتێك شاپوور لەخوراسان بوو، ساتروون هێرشی کردە سەربەشێك لەپانتاییەکانی سواد. کاتێك شاپور گەرایەوە، لەم کارەی ساترون ئاگاداریان کردەوە. شاپوور هێرشی کردە سەر و بۆ ماوەی چوار ساڵ و بە وتەی دەستەیەك کەس بۆ ماوەی دو ساڵ گەمارۆیدا بەلآم نەیتوانی قەلآکەی تێك بشکێنێت یا بڕواتە ناو قەلآکەی.

ضیزن کچێکی بووبەناوی نەزیرە. ئەو نەخۆشی مانگانەی گرت هاوشێوەی نەریتی ئەو رۆژگارە، بردیانە دەوروبەری شار. یەکێك لەجوانترین ژنانی جیهان بوو و شاپوور یەکێك لەجوانترین پیاوەکان. هەرکام لەم دووانە یەکیان بینی و عاشقی یەك بوون. کچ بۆ شاپوور پەیك و پەیامی نارد: ئەگەر چۆنیەتی تێکشکاندنی

دیوارەکانی شار بەتۆ بڵێم، چی بەمن دەبەخشیت؟ شاپوور وەڵامی دایەوە: سەروەری بەتۆ دەبەخشم و لەپێشی لەژنانیتر. کچ پەیامی دا: کۆترێکی خۆڵەمێشی رەنگ بگرە و تەوقی بکەرە مڵ و بەخوێنی مانگانەی کچێکی چاوشین لەسەر قاچی بنووسە و بەرەڵای بکە. ئەو کۆترە دێتە سەر دیواری شار و دەروخێت. نهێنی جادووەکەی ئەمەبوو. ئەم کارەی کرد و دیواری شار دارما وبەزۆری شمشێر دەستی بەسەردا گرت. زیزن و هاورێکانی کوشت. لەوان کەس نەمایەوە بناسرێتەوە. شارەکەی وێران کرد و نەزیرەی کردە هاوسەری خۆی و لەعین التمر ل باوەشیدا نۆخزنی گرت. کچ سەراسەری شەو لەتاو ئازار دەتلایەوە و ئەردەشیر هەرچەندە هەولێدا، هەستی بەهۆکاری ئازارەکەی نەکرد. لەم کاتەدا پەڕی گوڵێکی بینی بەسەر یەکێك لەچرچەکانی سکیەوە لکابوو. شاپوور وتی: باوکت بەچی پەروەردەی دەکردی؟ کچ وتی: بەرۆنەکەرە، مێشك، هەنگوین و شەراب. شاپوور وتی: سوێند بەگیانی باوکت، مەگەر نەنەوەی من خێراتر لەباوکت تۆم ناسی! دواتر فەرمانیدا: پیاوێك لەسەر ئەسپێکی سەرکێش سواربوو و پرچە درێژەکانی ئەو کچەی بەکلکی ئەسپەکەوە گرێدا، لەناکاو ئەسپی غاردا و کچی تیکە تیکە کرد. وتاربێژانی عەرەب لەوتارەکانی خۆیان زۆریان ئاماژە بەم زیزنە داوە.

لەرۆژگاری شاپوور مانی زەندیق دەرکەوت و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و خەڵکانێك شوێنی کەوتن کەپێیان دەوترێت مانەوی.

رۆژگاری پاشایەتی ئەو سی ساڵ و پانزە رۆژ درێژەی کێشا. دەستەیەك دەڵێن: سی و یەك ساڵ و شەش مانگ و نۆ رۆژی خایاند.

## پاشایەتی هورموزان کوڕی شاپوور کوڕی بابەك

لە پەیکەر و ئەندام هاوشێوەی ئەردەشێر بوو بەڵام وڵاتداری و کارزانی ئەوی تیا نەدەبینرا. پیاوێکی زیاد لەرادە دڵڕەق و سەختگیر و بوێر و ئازا بوو. دایکی لەکچەکانی مێهرەك پاشا بوو کە ئەردەشێر کوشتی و هەموو مناڵەکان و کەس و کاری خستە بەردەم تیغی تیژی شمشێر. ئەمە کوشتارەی لەبەر ئەوە بوو ئەستێرەناسەکان پێیان وت لەنەژادی ئەو پاشایەك دێتە سەرتەخت. دایکی بۆ بیابان هەڵات و لای شوانێك مایەوە. شاپور بۆ راو رۆشتەدەر، هەستی بەتینویەتی کرد. ئەو خێوتانەی بینی دایکی هورموز تیایدا دەژیا، شاپور نزیك کەوتەوە و داوای ئاوی کرد.

کچ ئاوی پێدا و شاپوورجوانی سەرسورهێنەری ئەوی بینی. زۆری نەخایاند یەکێك لەشوانەکان گەڕایەوە و شاپوور لەرەچەڵەکی کچەی پرسی. یەك لەوان وتی: کچی منە. شاپوور ئەوی بۆ هاوسەری خۆی هەڵبژارد و بردی و پاکی کردەوە و جل و بەرگی پۆشاند. ویستی نزیکی لەگەڵ بکات بەڵام کچ خۆی بەدەستەوە نەدا و بۆماوەیەك داخی لەسەر دڵی پاشا دانا. کاتێك ئەمەی بینی لەهۆکاری ئەم کارەی پرسی. کچ وتی کچی مێهرەکە و بۆیە ناهێڵێت نەکا لەئەردەشیر زیان بەشاپوور بگات. شاپوور پەیمانی پێدا ئەم نهێنیە بەنهێنی بهێڵێتەوە. لەسەر جێگای خەوت و هورمزی بۆ هێنایە دنیا. شاپوور بەنهێنی هێشتیەوە تا ساڵەکان لەتەمەنی هورمز بەسەرچوو.

رۆژێك ئەردەشیر سوار بوو و بەشێوەیەکی نیهێنی رۆشتە ماڵی کورەکەی خۆی شاپوور. کاتێك نۆقرەی گرت، هورمز چۆگان بەدەست بەدوای گۆیدا رایکرد و هاواری کرد. ئەردەشیر کاتێك ئەوی بینی سەری سورما چوونکە لێکچونی زۆری لەنێوان خۆی و ئەو ((وەك جوانی و بەهێزی و ئەندام رێکی)) بینی و پرسیاری ئەوی لەشاپوور کرد. شاپوور بیرمەند هاتەدەرو بیری کردەوە تا تاوانەکەی خۆی بگرێتە ئەستۆ. ئەو هەموو شتێکی بەراستی بۆ باوکی گێرایەوە. ئەردەشیر شادمان و

پێی وت: ئەوەی ئەستێرەناسەکان وتوویانە، لەکورەکەی تۆ(لە نەژادی مێهرەك)) هاتۆتەدی و ئێستا گیانی من نارامی گرت و ئەوی تیایدا بووە (ئەو ترسەی تیای بووە)نەماوە.

کاتێك شاپوور بەپاشایەتی گەشت، هورموزی کردە فەرمانرەوای خوراسان و ڕەوانەی ئەو سەرزەمینەی کرد. ئەو دوژمنەکانی سەرکوت و تەنیا و سەربەخۆ فەرمانرەوایەتی کرد. ئاژاوەچییەکان ترسیان خستە دڵی شاپوور کە کورەکەت دەیەوێت تاجی پاشایەتی لەتۆ وەربگرێت. هورموز ئەمەی بیست — و بەپێی ئەوەی وتراوە- دەستی خۆی بڕی و بۆ باوکی نارد. ئەو بۆ باوکی نامەی نوسی کەخراپەخوازی خراپەکارانی بیستوە و ئەم کارەی کردووە تا گومانی نەهێڵێت چوونکە ئێرانییەکان نەریتیان بەم شێوە بوو پیاوێکی زیان دیتوو (یەك دەست، یەك پێ، شەل و...)یان نەدەکردە فەرمانرەوای خۆیان. کاتێك دەستی بڕاوی کوڕ گەشتە لای باوك، پەرێشان بوو و لەخەمی کور دڵی لەت لەت. ئەو نامەی بۆ هورموز نوسی و ئاگاداری کردەوە لەبڕینی دەستی ئەو چەندە بە پەرۆش و ناراحەتە. ئالأی پاشایەتی دوای خۆی بۆ ئەو هەڵکرد و کردیە پاشای ئێران زەمین. کاتێك هورموز پاشایەتی گرتەدەست، لەنێوان خەڵك بەدادپەروەری فەرمانرەوایەتی کرد و راستگۆیی کردە پیشە و درێژەی بەرێگەی باوکانی دا. بناغەی شارستانی رامهۆرموزی دارشت. رۆژگاری پاشایەتی ئەو یەك ساڵ و دە رۆژ درێژەی کێشا.

## پاشایەتی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور

ئەوپیاوێکی خۆراگر و ئارام بوو، مانی زەندیقی کوشت و پێستی داماڵی و پڕی کرد لەکا و لەسەر دەروازەی یەکێك لەدەروازەکانی جوندی شاپوور- ئێستا بەدەروازەی مانی دەناسرێت- هەڵایواسی.

رۆژگاری پاشایەتی ئەو سێ ساڵ و سێ مانگ و سێ رۆژ درێژەی کێشا.

نوێنەری شاپوور کوڕی ئەردەشێر و کورەکەی هورموز و بەهرام کوڕی هورموز

(لەسەر هۆزی رەبیعە، موزیَر هۆزەکانی تری نیشتەجێی بیابانی عێراق و حیجاز و جەزیرەی ئەو سەردەمە) دوای لەناوچوونی عەمرۆ کوڕی عودەی- یەکێك لەکورەکانی عەمرۆ کوڕی عودەی بەناوی ئەمرو القیسی یەکەم بوو. ئەو یەکەم کەس لەبنەماڵەی ئەسر کوڕی رەبیعە، هەروەها یەکەم کەس لەنوێنەرانی ئێران بوو باوەری بەئایینی مەسیحی هێنا. ئەو لەپانتایی فەرمانرەوایی خۆی بۆ ماوەی ١١٤ ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد لەم ناوەدا: لەرۆژگاری شاپوور کوڕی ئەردەشیر بیست و سێ ساڵ و یەك مانگ، هورموز کوڕی شاپوور یەك ساڵ و دە رۆژ و بەهرام کوڕی هورموز سێ ساڵ و سێ مانگ و سێ رۆژ.

## پاشایەتی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشیر

پاشایەکی شیاو و زانیاری زۆری لەسەر کاروبارەکان بوو. کاتێك تاجی خستە سەر، مژدەی دادپەروەری بەخەڵکاندا. لەبارەی ساڵەکانی فەرمانروایەتی ئەو جیاوازی هەیە. دەستەیەك هەژدە ساڵ و دەستەیەك حەفدە ساڵیان بۆ دیاری کردووە.

## پاشایەتی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور.

کاتێك تاجی خستەسەر، گەورەکانی دەربارە لەخوا بۆ ئەو پارانەوە و ئەو وەڵامی چاکەی دانەوە. پێش پاشایەتی، فەرمانرەوای سیستان بوو. بۆ ماوەی چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

## پاشایەتی نێرسی کوڕی بەهرام

برای بەهرامی سێیەمە. کاتێك تاجی لەسەر دانا. گەورەکان و دەرباریان ڕۆشتنە لای و لەخوا پاڕانەوە و ئەو موژدەی دادپەوەری پێدان و بەدادپەروەری پاشایەتی کرد و وتی: سپاس کردن لەبەرابەر ئەوەی خوا بەنێمەی بەخشیوە، پشتگوێ ناخەین. نۆ ساڵ پاشایەتی کرد.

## پاشایەتی هورموز کوڕی نێرسی کوڕی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز

پیاوێکی دڕندە بوو لەبەر ئەمە خەڵکان لێی دەترسان. ئاگاداری کردنەوە لەوەی دەزانێت لەفەرمانڕەوایەیتی سەختگیرانەی ئەو دەترسن، بەڵام خوا سەختگیری و دڵرەقی ئەوی بۆ نەرمی و بەخشندەیی گۆڕیوە. نەرمترین هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەوان گرتەبەر. شەیدای شاد کردن و بەخشین بەهەژاران و خوازیاری ئاوەدان کردنەوە و دادپەروەری بوو. ئەو مرد و کوڕی نەبوو لەجێگەی ئەو تاج بکاتەسەر. ئەم کارە لای خەڵکان دژوار و لەبارەی سکپڕی هاوسەرەکانی پرسیاریان کرد و وەڵامیان بیست کەیەکیان سکپڕە.

دەستەیەك دەڵێن: هورموز تاج و تەختی دوای خۆی بەو مناڵە لەدایك نەبووە بەخشیبوو. ژن شاپوور شان کونکەرەی هێنایە دنیا. ڕۆژگاری پاشایەتی ئەو شەش ساڵ و پێنج مانگی خایاند. دەستەیەك دەڵێن: حەوت ساڵ و پێنج مانگ. ناوی پاشاکانی ساسانی لەشاپوورەوە تا ئێرە کەم و کوڕی تیا نابینرێت.

## پاشایەتی شان کونکەرە (زو الاکتاف)

نەژادنامەی بەم شێوەیە: شاپور کوڕی هورموز کوڕی نێرسی کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەك. دەڵێن لەسەر پێشنیاری باوك وەك پاشا هەڵبژێردرا. خەڵك لەبەدنیا هاتنی شادمان بوون و ئەم هەواڵەیان لەهەموو سوچ و قوژبنەکانی دنیا بڵاو کردەوە. هاوشێوەی باب و باپیران پێگەی بەوەزیر و دەبیرەکان بەخشی.

پاشاکان بیستیان شای شاکانی ئێران منالی ناو لانکەیە. لەبەر ئەمە، پاشاکانی تورك و عەرەب و رۆم چاوی تەماحیان لەئێران بڕی. عەرەبەکان نزیکترین خەڵکان لەسەرزەمینی ئێران بوون. لەبەر ئەمە ژمارەیەکی زۆر لەوان لەهۆزی عەبدالقیس و خەڵکی بەحرەین لەرێگای دەریاوە هێرشیان کردە سەر ئێران و قەراغەکانی ئەردەشێر خەرە و ساز و بەرگ و ژیان و مەرومالاَت خەڵکیان بەزۆر داگیر کرد و وێرانی زۆریان بەجێهێشت. ئەوان رۆژگارێك لەسەر ئەم کارەیان بەردەوام بوون و کەس لەئێرانیان بۆ بەرپەرچ دانەوەیان هەڵنەستا چوونکە پاشاکەیان منالێك زیاتر نەبوو.

کاتێك گەشەی کرد و گەورەبوو، یەکەمین نیشانەکانیان لەبیرتیژی و زیرەکی ئەو بینی. لەدەریا هات و هاواری خەڵکانی بیست و لەهۆکارەکەی پرسی. پێیان وت: خەڵك لەسەر پردی دیجلە هاتوچۆ دەکەن و بەدژواری لەناو قەربالغی یەك تێدەپەڕن. فەرمانیدا پردێکی دیکە دروست بکەن. پردێك بۆ ئەوانەی دێن و یەکێیان بۆ ئەوانەی دەڕۆن. خەڵك لەم بیرتیژییەی ئەو شادمان بوون. کاتێك گەشتە تەمەنی شانزە ساڵی و توانای هەڵگرتنی نامێر و نامرازی شەری پێبڕا، هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و لێك پچڕانی کارەکانی بیرخستنەوە و وتی دەیەوێت خۆراگری لەبەرابەر نەیاران و دوژمناندا بکات و دژیان بجەنگێت. خەڵك لەخوا پارانەوە و داوایان لێکرد لەپایتەخت بمێنێتەوە و سوپا و فەرماندەکان بۆشەڕ بنێرێت، تا فەرمانەکانی جێبەجێی بکەن. بەلاَم رازی نەبوو و لەناو سوپاکەی خۆی هەزار پیاوی شەرکەری

هەڵبژارد. داوایان لێکرد شەڕکەری زیاتر هەڵبگرێت بەڵام ئەو بەمە بەسەندەی کرد. شاپوور هاوڕێ لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و داوای لێکردن هیچ عەرەبێك بەزیندوویی نەهێڵنەوە. دواتر مەبەستی سەرزەمینی پارسی کرد و هێرشی کردە سەر ئەو عەرەبانەی لەوێ نیشتەجێ بوون و زۆری لەوان کوشت و دیلی گرت. دواتر لەبەحرەین تێپەری و گەشتە (خط) و دانیشتوانی بەحرەینی کوشت بێ ئەوەی گرنگی بەتالآنییەکان بدات. دواتر رۆشتە هیجر کەخەڵکانێك لەهۆزی تەمیم و بەکر کوڕی وایل و عەبدالقەیس لەوێ دەژیان. ئەوەندەی لەوان کوشت خوێنیان رژایە سەر زەوی. عەبدالقەیسی لەناو برد و روی کردە یەمامە و ژمارێکی زۆری لەخەڵکی ئەو سەرزەمینە کوشت و ئاوی عەرەبەکانی بەخاك پڕ کردەوە و کوێری کرد. دواتر مەبەستی بەکر و تەغلەبی کرد کەلەبەرزاییەکانی نێوان شام و عێراق دەژیان. ئەوانی کوشتار و دیل کرد و کانیاوەکانی پڕکردەوە. رۆشت تاگەشتە نزیك شارستان و هەمان بەڵای بەسەر خەڵکانی ئەو ناوچەیە هێنا. شانی ئەوانی کون دەکرد و ئەوانی دەکوشت لەبەر ئەمە پێی دەڵێن شان کونکەرە. تا رۆژی مردنی ئەم کارەی دەکرد. لەم کاتەدا ئەیادییەکان بۆ جەزیرە گواستیانەوە و هێرشیان کردە سەر سواد. شاپور سوپاکەی بۆ شەڕی ئەوان نارد. لەقیتی ئەیادی لەگەڵ ئەوان بوو و ئەم شێعرانەی بۆ خەڵکانی هۆزی ئەیادی نوسی و بۆی ناردن:

| | |
|---|---|
| سلام من الصحيفة من لقيط | الي من بالجزيرة من اياد |
| بان الليث كسرى قد اتاكم | فلا يشغلكم سوق النقاد |
| اتكم منهم سبعون الفا | يزجون الكتائب كالجراد |

واتاکەی:

لەنامە سڵاوێك لەلەقیت بۆ ئەیاد کەدانیشتوانی جزیرەن. پەیام ئەوەی کە: شێری شکاری خوسرەو مەبەستی هێرش کردنە سەر ئێوەی هەیە. نەکات بازاری ئاڵ و گۆری زێر و زێو ئێوە لەوان بێ ئاگا بکات. لەوان حەفتا هەزار کەس هێرشیان کردۆتە سەرئێوە. ئەوان لەچەندین دەستە و هێز وەك مێرو و کوڵە هێرشبەر بەرەو

ئێوە بەرێکەوتون.

ئەیادیەکان بەقسەیان نەکرد و درێژەیان بەتالآنییەکانی خۆیاندا. ئەو بۆ ئەوانی نوسی:

ابلغ ايادا و طول في سراتهم          انى ارى الراى ان لم اعص قد نصعا

واتاکەی:

وتەی من بەئەیاد بگەیەنە و گەورەی ئەوان ئامۆژگاری بکە: پەیامی من ئەوەیە: من راستی دەبینم و ئامۆژگاری راست بەئێوە دەڵێم و ئەنجامی کارەکان. با وابێت لەفەرمانەکانی من خۆتان دوور نەخەنەوە.

ئەم قەسیدە ناودارە لەبارەی هەواڵدانی چۆنیەتی شەڕە و یەکێکە لەباشترین قەسیدەکان لەمبارەوە. ئەیادییەکان پەندیان وەرنەگرت. لەبەر ئەمە شاپوور هێرشی کردە سەریان و هەموویانی کوشت و لەناوی بردن. خەڵکانێك لەوان پەیوەستی رۆمیەکان بوون و لەزیانی شمشێری ئەو رزگاریان بوو. هەڵس و کەوتی لەگەڵ عەرەبەکان بەم شێوە بوو.

بەرابەر بەرۆمەکانیش ئەم هەڵس و کەوتەی گرتەبەر کەلەگەڵ پاشاکەیان کۆنستانتین پەیمانی ئاشتی بەست. ئەو یەکەم کەس لەرۆمییەکان بوو باوەری بەئایینی مەسیحی هێنا. ئێمە لەکاتی ئاماژەدان بەکۆتایی بەسەرهاتی شاپوور، هۆکاری باوەرهێنانی ئەو بەخواستی خوا باس دەکەین. کۆنستانتین مرد و وڵاتەکەی لەنێوان سێ کوڕەکەی دابەش کرد. ئەوان بەپاشایەتی گەشتن و رۆمییەکان دوای ئەوان کەسێکیان لەبنەماڵەی کۆنستانتین بەناوی ئۆلیانوس کردە فەرمانرەوای خۆیان. ئەو لەسەر ئایینی پێشوی رۆمیەکان بوو. کاتێك بوو بەپاشا، ئایینەکەی خۆی ئاشکرا کرد و دینی پێشووی رۆمیەکانی گەراندەوە و پەرسگاکانی خوای وێران کرد و قەشەکانی کوشت و سوپای لەرۆم و خەزەر کۆکردەوە و مەبەستی شەڕی

شاپووری کرد. عەرەبەکانیش بۆ تۆڵەسەندنەوە لەشاپور کۆبوونەوە و لەناو سوپاکەی ئۆلیانوس ژمارەیەکی زۆر لەوان دەبینرا. سیخورەکانی شاپوور لەناو دوژمن، گەرانەوە و هەواڵی جۆراوجۆریان باس دەکرد. شاپوور خۆی لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوەڵە باوەرپێکراوەکانی بەرەو رۆم بەرێکەوت. کاتێك گەشتە نزیك یوسانوس (یوییانوس) کەفەرماندەی پێشەنگەکانی رۆم بوو، خۆی داشارد و چەند کەسێکی بەرەو رۆم نارد. ئەوان گرفتار بوون و دەستەیەکیان دانیان بەوەدنا کە شاپوور ئەوانی ناردووە. یوسانوس بە نهێنی پەیامی بۆنارد و ئاگاداری کردەوە. شاپوور بۆ لای سوپاکەی خۆی گەرایەوە و لەنێوان ئێرانییەکان و عەرەبەکان و رۆمەکان شەرێکی قورس رویدا. سوپای شاپوور شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەوان کوژرا. رۆمییەکان دەستیان بەسەر شاری تیسفوندا گرت (تیسور، تیستور) کەهەمان مەداینی رۆژهەلاتە. هەروەها سامان و گەنجەکانی شاپووریان تالآن کرد.

شاپوور نامەی بۆ فەرماندە و سوپاکەی خۆی نووسی و ئاگاداری کردنەوە کەلە رۆمەکانەوە چ زیانێکی بەرکەوتووە. ئەوانی بۆ هاتن و یارمەتیدانی خۆی بانگ کرد. سوپاییەکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو گەرایەوە و شاری تیسفونی رزگار کرد و ئەلیانوس هات و لەشاری بەهرسیر نیشتەجێ بوو. نێردراوان لەناو ئەواندا هات و چۆیان دەکرد. رۆژێك ئەلیانوس دانیشتبوو لەناکاو تیرێك کە هاوێژەرەکەی نادیاربوو، سنگی پێکا و دەستبەجێ گیانی سپارد. رۆمییەکان پەرێشان و لەرزگاربوون بێ هیوا بوون چوونکە نەیاندەتوانی لەئێران بگەرێنەوە. داوایان لەیوسیانوس کرد ببێتە پاشای ئەوان بەلآم رازی نەبوو مەگەر ئەوەی بگەرێنەوە سەر ئایینی مەسیحی. پێیان وت هەموو مەسیحین و دینی خۆیان لەترسی ئۆلیانوس دادەشارد. ئەو بووە پاشای ئەوان. لەم لا شاپوور رۆمییەکانی دەترساند و داوای لەفەرمانرەواکەیان کرد بروات و چاوی پێی بکەوێت. یوسیانوس هاورێ لەگەڵ هەشتا پیاو هاتە لای شاپوور و شاپوور میوانداری کرد و هەر دووك لەبەردەم یەکدا سەریان دانەواند و دەستیان بەخواردن کرد. شاپوور هەوڵەکانی یوسیانوسی بەرز نرخاند و بەرۆمییەکانی وت: ئێوە ولآتەکەی ئێمەتان وێران و لەناوتان برد. یا بەهای ئەوەی لەناوتان بردووە بدەن، یا شاری نەصیبین بگەرێننەوە بۆ ئێمە تا

تاوانی وێرانکارییەکەتان بێت. ئەم شارە لەسەردەمی باستانەوە مڵکی ئێرانییەکان بوو و رۆمیەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو. رۆمیەکان ئەم شارەیان بۆ ئێران گەراندەوە و باریان کرد و شاپوور دوانزە هەزار کەس لەدانیشتوانی ئیستەخر و ئیسفەهانی بۆ ئەو شارە کۆچ پێکرد. رۆمییەکان گەرانەوە و دوای ماوەیەك پاشاکەیان مرد.

دەستەیەك دەڵێن: شاپوور رۆشتە سنورەکانی رۆم و بەهاوەڵانی خۆی وت دەیەوێت بەنهێنی بڕواتە ناو رۆم و لەچۆنیەتی کار و ژیانی خەڵکی شار و دێ کانی ئەوان ئاگادار ببێتەوە. رۆشت و ماوەیەك لەناو ئەواندا گەڕا. ئاگاداریان کردەوە قەیسەر سفرەی بۆ هەمووان راخستووە و خەڵکی کۆکردۆتەوە تا لەسفرەکەی نان بخۆن. ئەو لەجلێ و بەرگی پرسیارکەراندا رۆشتە ئەوێ تا سزار لەسەر سفرە ببینێت. ئەویان ناسییەوە و گرتیان و خستیانە ناو پێستی مانگا و بەستیانەوە. قەیسەر لەگەڵ سوپاکەی رۆشتە سەرزەمینی فارس و شاپووری بەهەمان شێوە لەگەڵ خۆیدا برد. کوشتار و وێرانی زۆری کرد تاگەشتە جوندی شاپوور. خەڵکی ئەو شارە لەناو قەڵاکاندا مانەوە و قەیسەر گەمارۆی خستە سەر شارەکە. رۆژێك پاسەوانەکان و راسپێردراوان لەسەر شاپوور لێی بێ ئاگا بوون. لەنزیك ئەو کۆمەڵێك لەدیلەکانی ئەهواز گرفتار کرا بوون. فەرمانی پێدان بەسەر ئەو پێستەی تیایدا زیندانی کرابوو، رۆن برێژن. ئەم کارەیان کرد و پێستەکە نەرم بوو، شاپوور لێی هاتەدەر و پاسەوانەکانی شاری ئاگادار کردەوە و رۆشتە ناو شار. شاپوور خەڵکی شاری کۆکردەوە و ئامادەی کردن و ساز و کەرستەی شەڕکردنی پێبەخشین و بەرەبەیانی ئەو شەوە هێرشی کردە سەر رۆمییەکان و زۆری کوشت و قەیسەری بەدیلی گرت و سامان و ژنەکانی ئەوی تاڵان کرد. ئەو پاشای رۆمی بە ئاسنی قورس بەستەوە و فەرمانی پێدا ئەوی وێرانی کردووە، ئاوەدانی بکاتەوە و لەجیاتی دارخورما، زەیتون بروێنێت. دواتر ئەوی خەساند، سوار کەرێکی کرد و بۆ رۆمی نارد و وتی: ئەمە سزای ستەمکاری تۆ لەسەر ئێمەیە. ماوەیەك مایەوە و دواتر شەڕی کرد، کوشتی و دیلی گرت و دیلەکانی لەشارێك کەلەپانتایی شووش دا دروستی کرد و ناوی نا(ئێران شاری شاپوور) نیشتەجێ کرد. بەوتەی دەستەیەك ئەو شاری

نەیشابووری لەخوراسان دروست کرد. ئەو لەعێراق بناغەی شاپووری گەورەی دارشت.

پاشایەتی ئەو حەفتا و دوو ساڵی خایاند. لەسەردەمی ئەو نوێنەری فەرمانڕەوای ئەو لەسەر عەرەبەکان (بەناوی ئەمرۆ القەیس کوڕی عەمرۆ کوڕی عودەی)مرد و شاپوور کورەکەی عەمرۆ کوڕی ئەمرۆ القەیسی لەجیاتی باوك لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشاند. ئەو لەسەردەمی ماوەی شاپوور و هەموو سەردەمی پاشایەتی براکەی ئەردەشیر کوڕی هورموز و بەشێك لە سەردەمی شاپوور کوڕی شاپوور ژیا.

## هۆکاری باوەڕ هێنانی قەیسەر

هۆکاری باوەڕهێنانی قەیسەر بەئایینی مەسیحی ئەمەیە،دەڵێن: ئەو پیر و ئەخلاق ناشیرین و توند و تیژ و خۆی پیس دەکرد. رۆمییەکان ویستیان لەپاشایەتی دووری بخەنەوە و سامانەکەی بۆ بەجێبێڵن. ئەو لەگەڵ چاکخوازەکانی خۆی راوێژی کرد و ئەوان وتیان: توانای خۆراگری لەبەردەم خەڵکمان نییە چوونکە بۆ لابردنی تۆ پەیمانیان داوە. بە فریو و فێڵی دینی کاری خۆت رێکبخە و کەری خۆت وەپەرێنە. ئایینی مەسیحی لەم کاتەدا بەشێوەیەکی نهێنی لەناو خەڵکدا بڵاو ببوویەوە. پێیان وت: داوای دەرفەتیان لێبکە تا سەردانی بیت المقدس بکەیت. کاتێك رۆشتیتە ئەوێ، باوەر بەئایینی مەسیحی بێنە و خەڵکیش بۆ باوەرهێنان هانبدە کەلەبەردەم تۆدا سەری رێز و کورنوش دادەنەوێن. زیانی کەسەکان لەسوودی خۆتا بۆی بگەرێ. دین بکەرە بیانوێك و نافەرمانان بەدەستی فەرمانبەرانی خۆت لەناو ببە چوونکە ئەمجارە شمشێری دودەم و تیژی دینت بەدەستەوەیە. هیچ خەڵکێك لەسەر دین شەڕیان نەکرد مەگەر ئەوەی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ئەو، ئەم کارەی کرد و کۆمەڵێکی زۆر شوێنی کەوتن و ژمارەیەکی زۆرتر بەناسازگاری لەگەڵ ئەودا مانەوە و لەسەر ئایینەکەی خۆیان (یۆنانی)بوون. ئەو شەڕی ئەوانی کرد و بەسەر ئەواندا زاڵ بوو، ئەوانی کوشتار کرد و زانست و کتێبەکانی ئەوانی سوتاند. شاری کۆنستانتین نۆپێڵی دروست کرد و خەڵکی بۆ ئەوێ کۆچدا. پێش لەمە رۆمیە (رۆم) پایتەخت ئەوان بوو. پاشایەتی ئەو سەقامگیر و بەسەر شامدا زاڵ بوو. خوسرەوانی ئێران پێشتر (پێش شاپوور شانکونکەرە) لەتیسفون (تستور)دەژیان و ئەمە هەمان شاری رۆژئاوایی مەداینە. کاتێك شاپوور لەسەر تەخت دانیشت، ئەیوانی لەمەداینی رۆژهەلات دروست کرد و رۆشتە ئەوێ وکردی بەپایتەختی خۆی کەتا ئێستا (ساڵی شەشسەد و بیست و پێنجی کۆچی) ماوەتەوە.

پاشایەتی ئەردەشیر کوڕی هورموز کوڕی نێرسی کوڕی بەهرام کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشیر کوڕی بابەك

(برای شاپووری شانکونکەرە)

کاتێك هاتە سەرکار، گەورەکانی کۆکردەوە و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. خەڵك دوای چوار ساڵ ئەویان لەسەر کار لابرد.

## پاشایەتی شاپوور کوڕی شاپووری شانکونکەرە

دوای لەسەر کار لابردنی مامی، ئەویان لەسەر تەخت دانیشاند. خەڵك لەرووخانی پاشایەتی باوکی لەسەر دەستی ئەو شادمان بوون. ئەو بۆ بەڕێوبەرانی خۆی نامەی نووسی و فەرمانی دادپەروەری لەگەڵ خەڵکی پێدان. ئەم فەرمانەیشی بۆ کەسانی دەوروبەر و وەزیرەکانی خۆی نوسی.

مامی لەسەر کارلابراوی فەرمانی لێبرد و خەڵکان لێی رازی بوون. دوای ماوەیەك لەپاشایەتی، گەورەکانی دەربار تەناف خێوەتەکەیان بڕی، خێوەتەکەی بەسەردا کەوت و مرد. پاشایەتی ئەو پێنج ساڵ درێژەی کێشا.

## بەهرام کوڕی شاپووری شانکونکەرە

بە کرمانشا ناوی دەبەن چوونکە باوکی لەژیانیدا ئەوی کردبووە پاشای ئەم ناوچەیە. دوای هاتنە سەر کار، نامەی بۆ فەرماندەکانی نوسی و فەرمانی ملکەچی و گوێرایەڵی پێدان. لەولاتداریدا هەڵس و کەوتی نەرم و نیان بوو. شاری کرمانی دروست کرد. شۆرشییەکان لەناو کوشتارکەران لێی راپەرین و یەك لەوان تیرێکی بۆ هاویشت و ئەوی لەسەر خاکی مەرگ دانیشاند. ئەو یازدە ساڵ پاشایەتی کرد.

## یەزدگێردی گوناحکار کوڕی بەهرام کوڕی شاپووری شانکونکەرە

دەستەیەك لەزاناكان دەڵێن ئەم یەزدگێردە برای بەهرامی كرمانشایە نەكوڕی ئەو. پیاوێكی دڵرق و توند و تیژ بووە. هیچ كارێكی لەكاتی خۆیدا نەدەكرد و هیچ شتێكی لەسەر جێگای خۆی دانەدەنا. بەدوای كارە ورد و كەم بەهاكاندا دەرۆشت و هەموو هێز و توانایی خۆی لەهەڵخەڵەتاندنی خەڵك و فێڵ و خراپەكاری بەكار دەبرد و ئەزمون و هۆشی فراوانی بۆ خراپە خوازی و خراپ كرداری لەخۆی نیشاندەدا و شانازی بەخۆیەوە دەكرد. پیاوێكی دڵتەنگ و ئەخلاق ناشیرین بوو، گوناح و تاوانە كەم بەهاكانی نەدەبەخشی وبەنێوەنجیگەری كەسەكان رازی نەدەبوو تەنانەت نێوەنجیگەری نزیكترین كەسەكانی. كەسانی زۆری بەتوندی گیرۆدەی تاوان و تۆمەت دەكرد و كەسی لەسەر شتێك ئەمین نەدەكرد. پاداشتی گیانبازییەكانی خەڵكانی نەدەدایەوە و ئەگەر كەمێكی دەبەخشی، بەبەهادار هەژماری دەكرد. ئەگەر دەیبیست یەك لەهاوەڵانی لەگەڵ یەكێك لەپەروەردە كراوەكان گەشتۆتە هاورێیەتیەكی پاك و بێ ریا، ئەوی لەسەر كار لادەبرد و لەدەرگای خۆی دووری دەخستەوە. لەگەڵ ئەمانەیشدا، هۆشێكی تیژ و فەرهەنگێكی دیار و زۆربەی زانستەكانی بەباشی دەزانی.

ئەو نێرسی فرەزان یا حەكیمی رۆژگاری خۆی وەك وەزیر هەڵبژارد. نێرسی پیاوێكی فرەزان بوو كەفەرهەنگی رۆژگاری خۆی بەباشی دەزانی. یەزدگێرد، نێرسی بە(هەزار بیدە) (هەزار بەندە، هەزار پیشە)ناو برد و خەڵك هیوادار بوون نێرسی كاروباری ئەو رێك بخات و وێرانییەكان ئاوەدان بكاتەوە بەڵام ئامانجی ئەوان دوور و نەهاتەدی.

كاتێك بەسەر وڵاتدا زاڵ و هێزی سەقامگیر بوو، گەورەكان و دەرباریان لێی ترسان (یا ریسوایان كرد). ئەو هێرشی زۆری كردە سەر ناتەوانان و خوێنی زۆری لەوان رشت.

كاتێك خەڵك گرفتاری بوون، لەدرگای خواپارانەوە و داوایان كرد هەرچی زوتر

ئەوان لەم زوڵمە رزگار بکات. مێژوونووسان گومان دەکەن لەگورگان بوو، رۆژێك لەکۆشکەکەی ئەسپێکی سەرکێشی بینی کەهاوتای نەبینراوە. فەرمانیدا زین و لغاوی بکەن. کەس نەیتوانی رامی بکات. یەزدگێرد رۆشتە لای و بەدەستی خۆی زین و لغاوی کرد. ئەسپ لەقەیەکی بەهێزی لەسینەیدا و دەستبەجێ گیانی دا. ئەسپیش غاریدا و کەس نیشانی لێبەدەست نەهێنا. ئەمە یەکێك لەچاکەکانی خوا لەگەڵ بەندەکانی بوو. رۆژگاری پاشایەتی ئەو بیست و دو ساڵ و پێنج مانگ و شانزە رۆژی خایاند.

عەرەبەکان دەڵێن: کاتێك ئەمرۆ القیس یەکەم مرد (ئەو کوڕی عەمرۆ کوڕی عودەی و لەرۆژگاری شاپوور دەژیا) شاپوور لەجیاتی ئەو، ئەوس کوڕی قلامی لەعەملاّقان دانا. پێنج ساڵ پاشایەتی کرد. بەدوای ئەو ئەمرۆ القیس کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەمرۆ القیسی یەکەم لەپانتایی فەرمانرەوایەتی پێشین لەسەر کار دانرا. بیست و پێنج ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد و لەرۆژگاری یەزدگێردی گوناحکاردا مرد. لەجێگەی ئەو کورەکەی نەعمان و دایکی بەناوی شەقیقە کچی باوکی رەبیعە کوڕی زوهل کوڕی شەیبانیان هێنایە سەر تەخت. ئەو خاوەنی بینای ناوداری (خورنەق)ە. هۆکاری دروست کردنەکەی ئەوە بوو: مناڵەکانی یەزدگێردی گوناحکار زیندوو نەدەمانەوە. ئەو بەدوای شوێنێکی پاك و خۆش ئاو و هەوادا گەرا و دەرەوەی حیرەیان نیشاندا. ئەو کورەکەی بەهرامی گوری بەنەعمان سپارد و فەرمانیدا کۆشکی خورنەقی بۆ دروست بکات تا ببێتە نشینەگەی ئەو. هەروەها فەرمانیدا ئەو بۆ دەشتەکانی عەرەب ببات. ئەو کەسەی خورنەقی دروست کرد وەستایەك بەناوی سێنێمار بوو. کاتێك تەواوی کرد، لەکارەکەی ئەو سەریان سورما. وتی: ئەگەر دەمزانی کرێکەم بێ کەم و کوڕی دەدەن بەشێوەیەك دروستم دەکرد لەگەڵ خۆردا بسورێت. نەعمان وتی: دەتوانی باشتر لەمە دروست بکەیت؟ فەرمانیدا لەبەرزایی کۆشکەوە خستیانە خوار و دەستبەجێ گیانیدا و عەربەکان کردیانە پەند و چەندین داستان و شیعریان بۆ وتووە.

نەعمان چەندین جار لەگەڵ پاشاکانی رۆم شەڕی کرد و مەینەتی و ئازاری زۆری بەسەر خەڵکانی ئەو سەرزەمینەدا هێنا، زۆری بەدیلی گرت و هەچەندە توانی

تالآنی کرد؟ پاشای ئێران دو لەشکری کردە هاورێی ئەو کەبەیەکیان دەوت(دوس) و زۆربەی شەڕکەرانی لەهۆزی تنوخ و ئەویتر (شهبا ) کە لەئێرانییەکان پێکهاتبوو. ئەو لەگەڵ ئەم دوو سوپادا شەڕی عەرەبەکان و نافەرمانانی خۆی دەکرد.

ڕۆژێك لەشوێنەکەی خۆی دانیشتبوو، لەکۆشکی مەزنی خورنەقەوە لەدەرەوەی دەروانی. لەو سەرەوە نەجەف و باغ و جۆگە جوانەکانی لەوەرزی بەهاردا بینی و دلخۆشیان کرد. بەوەزیرەکەی وت: ئایا هەرگیز ئەم دیمەنەت بینیوە؟ وتی: نا، خۆزگە بەردەوام دەبوو. پرسی: چی بەردەوامە؟ وەلآمی دایەوە: ئەوەی لەو دنیا لای خوایە. پرسی: چۆن دەکرێت پێی بگەین؟ وتی: بەپشت گوێ خستنی ئەم دنیایە و پەرەستینی خوا. ئەو هەمان شەو وازی لەپاشایەتی هێنا و جل و بەرگی کۆنەی لەبەر کرد و خۆی داشارد و کەس نیشانی لەو بەدەست نەهێنا. بەرەبەیان خەڵك بۆی گەران و نەیاندۆزییەوە.

پاشایەتی ئەو تا کاتی وازهێنان و خۆپارێزی، بیست و نۆ ساڵ و چوار مانگی خایاند. لەوناوە: لەرۆژگاری یەزدگێرد پانزە ساڵ و لەرۆژگاری بەهرامی گور کوڕی یەزدگێرد چواردە ساڵ. زاناکانی ئێران لەمبارەوە ئاماژەیان بەگێرانەوەیتر داوە کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

## پاشایەتی بەهرام کوڕی یەزدگێردی گوناحکار

کاتێك یەزدگێرد بەهرامی گوری هێنایە دنیا، بۆ پەروەردە کردنی پاشایەکی عەرەبی هەڵبژارد. لەبەر ئەمە، مونزەر کوڕی نەعمانی بانگ کرد و پەروەرد کردن و پارێزگاری لەشازادەی بەخت بەرزی بەو سپارد و ڕێزی لێگرت و کردییە گەورە و سەروەری عەرەبەکان. مونزەر لەگەڵ خۆی بردی و بۆ شیردانی ئەو سێ ژنی بەهێز و تەندوروست و وشیار و فرەزانی لەبنەماڵەی گەورەکان هەڵبژارد. دووان لەوان لەرەچەڵەکی عەرەب بوون و یەکیان ئێرانی. ئەوان سێ ساڵ شیریان پێدا. کاتێك گەشتە تەمەنی پێنج ساڵی، ئامۆژگاران و مامۆستاکانی بۆ کۆکردەوە تا نوسین و زانستی دینی و تیرهاویشتنی فێر بکەن و ئەمانە لەسەر داوای بەهرام خۆی بوو. فرەزانێکی لەفرەزانەکانی ئێرانیشی بانگ کرد. بەهرام هەموو ئەو شتانەی ئەم فرەزانە فێری دەکرد، بە ڕاهێنانێکی کەم فێریان دەبوو. کاتێك گەشتە تەمەنی دوانزە ساڵی، لەهەر زانست و هونەرێکی سودمەند بەهرەوەر و لەمامۆستاکانی خۆی پێش کەوتەوە. بەهرام فەرمانی گەڕانەوەی پێدان. ئەوسا داوای ڕاهێنەری سوارکاری و تیرهاویشتنی کرد و ئەوەی بۆ ئەو شیاو و پێویست بوو، فێر بوو. ئەوسا فەرمانیدا ئەسە عەرەبیەکانی کێبڕکێ لەسواری ئامادەبن و لەم کاتەدا، ئەسپێکی سوور ڕەنگ لەمونزەر پێش هەموو ئەسپەکانی دیکە کەوت و ئەسپەکانیتر بەربلاّو هاتنەوە. مونزەر ئەو ئەسپەی گرت و بەدەستی خۆی پێشکەشی بەهرامی کرد.

بەهرام وەریگرت و ڕۆژێك بۆ ڕاو سواری بوو، لەناکاو دەستەیەك کەری کێوی بینی. تیری بۆ هاویشتن و بەدوای ئەوان ئەسپی غاریدا. لەم کاتەدا شێرێکی بینی کەهات و پشتەملی کەرەکێویەکی بەددان گرت و فڕاندی. بهرام تیرێکی هاویشت کەشێر و کەرە کێویەکەی پێکەوە دوری. تیری لاشەی هەر دووکیانی کون کرد و کەوتە سەر زەوی و یەك لەسەر سێی لەزەوی چەقی. هاوەڵانی ئەمەیان بینی و سەریان سورما. بەهرام دەستی بەرابواردن کرد.

کاتێك باوکی مرد، ئەو لای مونزەر کوڕی نەعمان بوو. گەورەکانی ئێران کەلەیەزدگێرد تاوان و خراپەکاری زۆریان بینیبوو، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن هیچ کام لەکورەکانی ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی دانەنێن. بڕیاریاندا پاشایەتی لەبەهرام

درێغ بکەن چوونکە لەلایەك ئەو لەناو عەرەبەکان گەورە بووە و هەڵس و کەوت و عادەتی ئەوانی گرتووە و لەلایەکیتر کوڕی یەزدگێردی گوناحکارە. ئەوان پیاوێك لەنەژادی ئەردەشێری بابەکان بەناوی خوسرەویان بۆ پاشایەتی هەڵبژارد. ئەو مونزەر و کورەکەی نەعمان و ژمارەیەك لەگەورەکانی عەرەبی کۆکردەوە وچاکەکاری باوکی خۆی لەگەڵ ئەوان و خراپەکاری لەگەڵ ئێرانییەکانی بیر خستنەوە. مونزەر وتی: لەم پێشهاتە نیگەران مەبە تامن چارەیەك بدۆزمەوە. ئەو کەرەستە و ساز وبەرگی شەڕی بەدەهەزار پیاوی شەڕکەری سوارکار بەخشی ولەگەڵ کورەکەی نەعمان بەرەو تیسفون و بەهرسیر، دو پایتەختی ئێران بەرێکەوت. فەرمانی پێدا لەنزیك ئەم دوو شارە نوردو لێبدات و پێشەنگەکانی خۆی بۆ شەر بنێرێت و هەرکەس روبەرووی بوویەوە، بەتوندی هێرشی بکاتەسەر و تالآنی بکات. نەعمان ئەو کارەی کرد. لەولا، گەورەکانی ئێران، پیاوێك بەناوی حەوابی، سەرپەرەستی دەبیرخانەی یەزدگێردیان بۆ لای مونزەر نارد تا هەواڵی هێرش و تالآنەکانی نەعمان بەگوێی ئەو بگەیەنێت. کاتێك حەوابی هاتە لای مونزەر، مونزەر پێیوت: بەپەلە برۆ بۆ لای پاشا (بەهرام). حەوابی هاتە لای بەهرام و لەمەزنی و گەورەیی ئەو ترسا و سەریسورما. بیری نەبوو سەری رێز و کورنوش دانەوێنێت. بەهرام ئەمەی زانی و بەنەرمی هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد و موژدەی هەرچی زیاتر و خۆشتری پێدا و ئەوی بۆ لای مونزەر نارد و فەرمانی پێدا وەڵامێکی شیاوی بداتەوە. مونزەر بەحەوابی وت: شا بەهرام نەعمانی بۆ سەرزەمینی ئێوە نارد چوونکە خوا ئەوی دوای باوکی کردۆتە پاشا. کاتێك حەوابی قسەکانی مونزەری بیست و هەڵس و کەوتی بەهرامی بیرهێنایەوە، زانی، دەکرێت هەموو ئەوانەی بەهرامیان لەپاشایەتی دوور خستۆتەوە، بەبەلگە و بورهان گوێرایەڵ و ملکەچ بکرێن. حەوابی بەمونزەری وت: بەرەو پایتەختی شاکان برۆ چوونکە گەورەکان و دەرباریان لەتۆ کۆدەبنەوە. لەم کارەدا راوێژ بکەن کەکەس لەگەڵ ئەوەی دەیڵێن، ناسازگار نابێت.

٤٠٢نك دوای گەرانەوەی حەوابی لای مونزەر، ئەو هاورێ لەگەڵ سی هەزار پیاوی ،رەب روی کردە پایتەختی ئێران. خەڵکی کۆکردەوە و بەهرام لەسەر

تەختێکی رازاوە بەگەوهەر هات. گەورەکانی ئێران دەستیان بەقسە کرد و خراپەکاری یەزدگێردیان بیرهێنایەوە و وتیان: لەسەر ئەم بنەمایە بوو پاشایەتیمان لەکورەکەی وەرگرتەوە.

بەهرام وتی: ئەوەی دەیڵێن بەدرۆی نازانم. من بەردەوام لێی تورە و بێزار بووم و بەردەوام داوام لەخوا دەکرد من بکاتە پاشا تا ئەوەی ئەو لەناوی بردووە ئاوەدان بکەمەوە. لەگەڵ ئەمەیشەدا ئەگەر دوای یەك ساڵ من هەموو بەڵێنەکانی خۆم نەبردەسەر، بەدڵخواز لەپاشایەتی واز دێنم. ئێستا بەو پێشنیارمیش رازی دەبم کە تاج و زێر و زیوە شاییەکان لەناوەراستی دو شێردا دابنێن، هەرکەس توانی هەڵیبگرێت، پاشایەتی ملکی ئەو بێت. موبدی موبدەکانیش ئامادەبوو و بەهرام بەخوسرەوی وت: تاج و زێرەکان بۆ خۆت هەڵبگرە. خوسرەو وتی: تۆ شیاوتریت چوونکە بەمیرات دەیبەیت و من داگیرم کردووە. بەهرام گورزێکی کرد و مەبەستی تاجەکەی کرد، یەك لەو دو شێرە پەلاماری دا و بەهرامیش بەرەو لای رایکرد، سوار پشتی بوو، هەردو لای کەلەکەی بەرانی خۆی گوشی و بە گورز لەسەری دا. دواتر شێرەکەیتر پەلاماریدا. بەهرام هەر دو گوێی گرت و یەك لەدوای یەك سەری دەکێشا بەسەری ئەو شێرەی لەسەر زەوی کەوتبوو. ئەوسا هەردووکیانی بەگورز کوشت، تاج و زێرەکانی هەڵگرت و تاجی لەسەرنا. یەکەم کەس فەرمانی برد، خوسرەو بوو. ئامادەبووان هەموو وتیان: ئێمە فەرمانبرداری تۆین و تۆ بۆ پاشایەتی پەسەند دەکەین و پێی رازی و شادمانین. وەزیر وگەورەکان داوایان لەمونزەر کرد لەگەڵ بەهرام قسە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات. مونزەر داوای لەبەهرام کرد و لێیان خۆش بوو.

بەهرامی گور لەبیستساڵیدا بوو بەپاشا و فەرمانیدا هۆکارەکانی ئاسوودەی و ئارامی خەڵك ئامادە بکەن. ئەو بۆ خەڵك تاجی کردە سەر و موژدەی بەختەوەری پێدان و بۆ خۆپارێزی لەبەردەم خوا فەرمانیدا. لەسەراسەری پاشایەتی خۆی رابواردنی و کامەرانی پێش کارەکانیتری دەخست بەشێوەیەك پاشاکانی دەوروبەر چاوی تەماحیان لەوڵاتەکەی بڕی. یەکەم کەس هەنگاوی هێنایە پێش و مەبەستی شەڕی ئەوی کرد، خاقانی تورك بوو کە لەگەڵ دووسەد و پەنجا هەزار پیاوی

شەڕکەر روی کردە ئێران. ئەم کارە بۆ ئێرانییەکان دژوار و گەورەکان لای بەهرام کۆبوونەوە و ئاگاداریان کردەوە. ئەو دەستی لەکامەرانی و رابواردن هەڵنەگرت. دواتر کەرەستەی ژیانی هەڵگرت و رویکردە ئازەربایجان تا لەئاتەشکەدەی ئەوێ بۆ پارانەوە و خوا پەرەستی دانیشێت. لەگەڵ حەوت لەگەورەکان و سێسەد پیاوی شەڕکەر سەرقاڵی راوکردن بوو لەئەرمەنستان و براکەی نێرسی لەجێگای خۆی دانا. خەڵك وتیان بێ گومان لەبەرابەر دوژمنەکەی خۆی رایکردووە. زۆرینەی خەڵك باوەریان وابوو ملکەچی خاقان بن و لەترسی زیانی ئەو بۆ گیان و وڵاتیان، باجی پێبدەن.

ئەم هەواڵە بەگوێی خاقان گەشت و ئەو لەوان ئاسوودە بوو. لەملا، بەهرام هاورێ لەگەڵ ئەو تاقمە، لەئازەربایجانەوە روی کردە لەشکری خاقان و لەشەڕدا خۆراگری کرد و خاقانی بەدەستی خۆی کوشت و سوپاکەی کوشتار کرد. ئەوانەی لەکوژران رزگاریان ببوو، شکستیان خوارد و هەڵاتن. بەهرام پێداگرانە بەدوایاندا رۆشت و دەیکوشت و دەیگرت و دیلی دەگرت. خۆی تەندروست و سوپاکەی بێ زیان گەرانەوە. بەهرام تاج و گۆچانی گەوهەر نیشانی خاقانیشی لەگەڵ خۆی هێنا. دەستی بەسەر چەند بەشێك لەوڵاتی تورکان گرت و پاسەوانانی سنوری لەسەر دانا. نێردراوانی تورك ملکەچ و فەرمانبردار هاتنە لای و سنوری وڵاتەکەی خۆیان لەگەڵ ئەو دیاری کرد تا لێی تێپەر نەبن. بەهرام یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی بۆ ئەوسەر روباری (ماورا النهر)نارد کەدەستی بەکوشتن و تاڵان و دیل گرتن کرایەوە. خۆی گەرایەوە بۆ عێراق و براکەی نێرسی کردە فەرمانرەوایی خوراسان و فەرمانی پێدا لەشاری بەلخ نیشتەجێ بێت.

ئاگاداریان کردەوە یەکێك لەگەورەکانی دەیلەم سوپایەکی زۆری کۆکردۆتەوە و هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکانی رەی و تاڵانی کردۆتە پیشە و خەڵکانی دیل کردووە. ئەو دەیلەمیە، وێرانی زۆری خولقاندووە و هاورێ سنورنشینەکانی ئەو لەدوور کردنەوەی ناتەوانن. ئەم کارە لای بەهرام گران و دژوار بوو. پاسەوانێکی سنوری لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو رەی نارد و فەرمانیدا کەسێك بەنهێنی بنێرێتە لای ئەو دەیلەمیە تا ببێتە هاورێیەکی نزیکی و تەماحی هێرش کردنە

سەر قولایی ئێرانی لا دروست بکات. ئەو پیاوە ئەم کارەی کرد و دەیلەمی سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر رەی. پاسەوانی سنور بەهرامی ئاگادار کردەوە . بەهرام نامەی بۆ نوسی بەرەوی دەیلەمی بروات و لەشوێنێك (کە لەنامەکەدا نوسیبووی) بمێنێتەوە. لەم کاتەدا بەهرام هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەهاوەڵە تایبەتەکانی بەرێکەوت و پەیوەستی سوپاکەی بوو. دەیلەمی لەهاتنی ئەو ئاگادار نەبوویەوە. لەبەر ئەمە تەماحکاری لەودا زیاتر پەرەی سەند. بەهرام سوپاکەی خۆی ئامادەی شەڕ کرد و هێرشی کردە سەر دەیلەمیەکان. روبەرویان بوویەوە و فەرماندەیی شەڕەکەی گرتە ئەستۆ و خۆی هەنگاوی خستە ناو ئاگرەکەی. سەرۆکەکەیانی گرت و سوپاکەیان تێکشکا. فەرمانیدا لەناویاندا جاربدەن هەرکەس پەیوەستی ئەمان بێت لەزیان بەدوور دەبێت. دەیلەمیەکان هەموویان پەیوەستی بوون و ئەو ئازاری پێنەگەیاندن و کەسی نەکوشت و بەنەرمی هەڵس و کەوتی لەگەڵ کردن. ملکەچی و فەرمانبرداری خۆیان نیشاندا. سەرکردەی ئەوانی بەزیندویی هێشتەوە و کردیە یەکێك لەنزیکە تایبەتەکانی خۆی.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم روداوە پێش شەڕ لەگەڵ خاقان بوو. و خوا زاناترە.

کاتێك بەسەر دەیلەمیەکان سەرکەوتی بەدەست هێنا، فەرمانیدا شارێك بەناوی فیروزی بەهرام دروست بکەن. ئەم شارە و دێهاتەکەی بۆ ئەو دروست کران. نێرسی کردە وەزیری خۆی و ئاگاداری کردەوە بەنهێنی دەیەوێت بڕواتە هیندستان. بەرێکەوت بەڵام کەس ئەوی نەدەناسی. لەگەڵ ئەمەیشدا هیندییەکان بوێری رووبەرووبوونەوەی ئەمیان لەگەڵ ئاژەڵە وەحشی و دڕندەکان دەزانی. لەم ناوەدا فیلێك دەرکەوت و رێگای گرت و کەسانی زۆری کوشت. بەهرام مەبەستی ئەوەی کرد بەدوایدا بڕوات تا لەپێی بخات. پاشای هیندستان ئەمەی بیست و پیاوێکی هیندی نارد تا بوێری ئەو لەنزیکەوە ببینێت و ئاگاداری بکاتەوە. بەهرام لەگەڵ ئەو پیاوە هیندییە بەرەو دارستان رۆشت. هیندی رۆشتە سەر دارێك و بەهرام لەفیل نزیك بوویەوە و کێشایەدەر. کاتێك لێی نزیك بوویەوە تیرێکی لەنێوان چاوەکانیدا. ئەوەندەی نەمابوو لەناو گۆشتی فیلەکەدا ون ببێت. دواتر لوتی گرت و بەردەوام دەیکوتا تا لەپێ کەوت. سەری لەجەستە جیا کردەوە و هەڵیگرت.

پیاوی هیندی، پاشای لەوەی بینیبووی، ئاگادار کردەوە. پاشای هیندی رێزی لەبەهرام- کەهێشتا بەتەواوی ناو و نیشانی ئەوی نەدەزانی- گرت و لەکار و چارەنوسی پرسی. بەهرام وتی کە پاشای ئێران لێی تووڕە بووە و لەبەر ئەمە، پەنای بۆ دەرباری هیند هێناوە. ئەم پاشایە دوژمنێکی بوو سەرسەختانە بۆ بەدەست هێنانی تاج و تەختی پاشایەتی کێبڕکێی لەگەڵ دەکرد. پاشا لەبەرابەر ئەو چۆکی دادابوو و دەیویست ملکەچی بێت و باجی پێبدات. بەهرام رێگری ئەم کارەی لێکرد و بۆ شەری دوژمن هانیدا. کاتێك روبەروی یەك بوونەوە بەهرام بەشاسەوارانی وت: ئاگاتان لەپشت سەری من بێت. دواتر هێرشی کردە سەریان و بۆ هەر سوچ و قوژبنێك دەرۆشت، لێی دەکوشتن، تێکی دەشکاندن و هەڵدەهاتن. هاورێکانی بەهرام هەمووی ئەوەی لەناو ئوردوی دوژمندا بوو وەك تالآنی کۆیانکردەوە. لەم کاتەدا پاشای هێند مەکران و دەبیلی بەبەهرام بەخشی وکچەکەی خۆی کردە هاوسەری. بەرهرام فەرمانیدا ئەو سەرزەمینانە پەیوەستی ئێران بکەن.

بەهرام شادمان گەرایەوە و نێرسی هاورێ لەگەڵ چل هەزار پیاوی شەڕکەر ناردە شەری رۆمەکان و فەرمانی پێدا داوای باج لەپاشاکانی رۆم بکات. ئەو رویکردە کۆنستانتین ئۆپێڵ (قوستەنتینە) و پاشای رۆم بەئاشتی لەگەڵیدا رێکەوت. ئەو لەگەڵ هەموو دەسکەوتەکانی بۆ لای بەهرام گەرایەوە. دەستەیەك دەڵێن: کاتێك لەخاقان و رۆم ئاسوودە بوو، بەتەنیایی خۆی رۆشتە سەرزەمینی یەمەن و گەشتە سەرزەمینی سودان یا (سواد) و پیاوە شەڕکەرەکانی ئەوانی کوشت و ژمارەیەکی زۆری بەدیلی گرت و بۆ وڵات گەرایەوە.

لەکۆتایی پاشایەتی، بەهرام رۆژێك بۆ راو رۆشتەدەر و بزنە کێویەکی بینی و بەدوایدا رۆشت و لەناکاو کەوتە چاڵێکی قووڵ و لەناودا خنکا. دایکی ئەم هەواڵەی بیست و رایکردە ئەوێ و فەرمانی دەرهێنانەوەی دەرکرد. ئەوان قور و لیتی زۆریان لەناو ئاوەکە دەرهێنا و چەندین تەپۆڵکەیان لێ دروست کرد بەڵام بەهرامیان نەدۆزییەوە.

رژگاری پاشایەتی ئەو هەژدە ساڵ دەمانگ و بیست رۆژ (یا بیست و سێ ساڵی) خایاند.

ئەبوو جەعفەری تەبەری لەژێر ناوی بەهرامی گور نوسیویەتی باوکی ئەوی بۆ پەروەردە کردن سپاردە نەعمان کوڕی مونزەر بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا. ئەو لەکاتی ئاماژەدان بەیەزدگێردی گوناحکار وتوویەتی ئەو کورەکەی بەنەعمان ئەمرۆ القیس سپاردووە تاگەورەی بکات. گومانی تێدا نییە دەستەیەك لەزاناکان پشتیان بەم گێرانەوەیە بەستووە و دەستەیەك بەویتر. بەلام ئەو بێژەری هیچ کام لەم دوقسەی ناو نەبردووە.

## پاشایەتی یەزدگێرد کوڕی بەهرامی گور

کاتێك تاجی شایی لەسەر کرد، بۆ میوانداری لەخەلك، کۆبۆونەوەیەکی گشتی رێکخست و ئاماژەی بەباوك و کارە چاکەکانیدا و ئەوانی ئاگادار کردەوە ئەگەر زەمانێکی درێژ لای ئەوان بۆ نەهێشتنی نیازەکانیان دانەنیشێت، گۆشەگیری بەردەوام لەبەرژەوەندی ئەوان و شەڕ لەگەڵ دوژمنەکانیان دەبێت. ئەو وتی نێرسی وەزیرەکەی باوکی لەشوێنەکەی خۆیدا هێشتۆتەوە. لەگەڵ خەلکەکەی خۆی بەدادپەروەری هەلس و کەوت و دوژمنەکانی سوك و ریسوا و سوپاکەی خۆی تەیار کرد. دو کوڕی بەناوەکانی فیروز و هورموز بۆ هاتە دنیا هورموز فەمانرەوای سیستان و دوای باوك دەستی بەسەر ولاتدا گرت. فیروز رایکرد و پەنای بردە بەر ولاتی هیپتالیان و لەپاشاکەیان داوای هاوکاری کرد. فیروز تالەقانی بەو بەخشی و لەبەرامبەر ئەم بەخشینە هاوکاری ویست. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی هاتە رەی و براکەی خۆی کوشت. هورموز و فیروز لەیەك دایك بوون. دەستەیەك دەلێن: ئەوی نەکوشت بەلکو پاشایەتی لێسەندەوە.

رۆمیەکان باجیان بەیەزدگێرد نەدا و نێرسی لەگەڵ ئەو سوپایەی باوکی یەزدگێرد کۆی کردبوویەوە، بەرێکەوت و خواستەکەی خۆی بەدەستهێنا.

پاشایەتی یەزدگێرد هەژدە ساڵ و چوار مانگ یا نۆزدە ساڵ بوو.

## پاشایەتی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی بەهرامی گور

(کوژرانی براکەی هورموز  و سێ لەخەزمەکانی)

کاتێك فیروز بەسەر براکەیدا زاڵبوو و بوو بەپاشا، دادپەروەری لەخۆی نیشاندا و بانگەشەی دینداری کرد. بەڵام ئەو پیاوێکی رەشبین و لەگەڵ خەڵکان خراپەکار و بۆ ئەوان شوم بوو. وڵات لەرۆژگاری ئەو بۆ ماوەی حەوت ساڵ توشی قات و قڕی و وشکەساڵی هات. روبار و کارێزەکان وشکیان کرد، ناوی دیجلە دابەزی، دارەکان وشك بوون، گیا و رووەکەکان ژاکان و لەدەشت و دەر وکێو سڕانەوە. باڵندەکان مردن، ئاژەڵە کێوی و دەشتییەکان لەناوچون و برسیەتی و نەداری یەخەی هەموانی گرت. ئەو نامەی بۆهەموو خەڵك نوسی و ئاگاداری کردنەوە کە باج لەسەریان نییە. فەرمانی بەخەڵکیدا و پێشنیاری کرد ئەگەر کەسێك پاشەکەوتی هەیە لەگەڵ ئەوانیتردا دابەشی بکات و رۆژگاری دارا و نەدار یەکسان بێت. ئەوانی ئاگادار کردەوە ئەگەر بزانێت لەشار یا ئاوەدانییەك کەسێك لەبرسانا مردووە، سزایان دەدات و لەناویان دەبات. وڵاتدارییەکی عاقڵانەی گرتەبەر کە کەس برسیەتی نەکێشا جگە لەپیاوێك لە دێی ئەردەشیر خەرە. فیروز لەدەرگای خوا پارایەوە و خوا وشکەساڵی هەڵگرت و وڵات بۆ بارودۆخی یەکەمی گەرایەوە.

کاتێك خەڵك و وڵات گیانێکی تازەیان گرت و ئەو دوژمن و نەیارانی خۆی سەرکوت کرد، رۆشتە شەڕی هیپتالیەکان. کاتێك پاشای ئەوان ئەخشنوار (ئەحسوار، ئەخشوار) ئەم هەواڵەی بیست، لەئێرانییەکان ترسا. یەکێك لەهاوەڵانی وتی: دەست وپێی من ببڕە و لەگەڵ بنەماڵەکەم بەباشی هەڵس و کەوت بکە. لەسەر رێگا فرێمبدە تا چارەی فیروز بکەم. ئەو ئەم کارەی کرد. فیروز لای تێپەری و لەحاڵی پرسی. وتی: بە ئەخشنوارم وت توانای بەرگری لەبەردەم فیروز و سوپای ئێرانمان نییە و ئەو ئەم بەڵای بەسەر هێنام. من رێگەیەکی نزیکترت نیشان دەدەم کە کەس ئەم رێگای نەگرتۆتەبەر. فیروز بەم هەواڵە شادمان و پشتی پێ بەست. ئەو فیروز و سوپاکەی بیابان لەدوای بیابان بەدوای خۆیدا برد و کاتێك زانی ناتوانن خۆیان رزگار بکەن، بەسەرهاتی خۆی بۆ ئەوان باس کرد. هاوەڵانی فیروز پێیان وت: ئێمە

ئاگاداریمان بەتۆدا بەڵام تۆ نەتبیست. ئێستا جگە لەپێشرەوی، چارمیەکیتر نییە. ئەوان رۆشتنە پێش و کاتێك روبەروی دوژمن بوونەوە، نیوە گیان و تینو بوون. تینویەتی زۆر کەسی لەوان لەپێ خستبوو. کاتێك خۆیان بەم شێواوی و شپرمزمییە بینی لەگەڵ ئەخشنوار رێکەوتن بەو مەرجەی وازیان لێبێنێت بۆ ولاتەکەی خۆیان بگەرێنەوە و فیروز سوێندی خوارد هیچ کات مەبەستی ولاتەکەی ناکات. ئاشتی لەسەر ئەم بنەمایە سەقامگیر بوو. فیروز نامەی ئاشتی نوسی و گەرایەوە. کاتێك لەولاتەکەی ئارامی گرت، رق و لەخۆرازیبوون ناچاری کرد جارێکیتر مەبەستی ولاتی ئەخشنوار بکات. وەزیرەکانی ئەویان لەشکاندنی پەیمانەکەی ئاگادار کردەوە بەلام رازی نەبوو و رۆشتە شەری ئەحشنوار. کاتێك لەوێ نزیك بوویەوە ئەخشنوار فەرمانیدا لەپشت سوپاکەی خەندەکێك بەپانایی دەگەز و قولای بیست گەز هەلکەنن و بەچیلکە و چەوێل و خاك دایپۆشن. کاتێك فیروز ئەم هەواڵەی بیست، لەشکست گومانی کرد و بەدوایدا رۆشت و سوپاکەی لەبوونی خەندەك ئاگادارنەبوون. ئەخشنوار هاتە لەشکرگای فیروز و هەموو ساز و بەرگی شەری بەتالان برد و موبد و ژنەکانی بەدیلی گرت. دواتر لاشەی فیروز و سوپاکەی دەرهێنا وەو لەگۆرستانەکاندا بەخاکی سپارد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك فیروز گەشتە خەندەکە هەڵکەنراوەکەی ئەخشنوار ( و هێشتا دانەپۆشرابوو) پردی لەسەر دروست کرد و بۆ خۆی وکەسەکانی ئالاکانی هەلکرد تا لەکاتی گەرانەوە رێگای خۆیان بناسنەوە. ئەو سوپاکەی لەخەندەك تێپەرین. کاتێك دوو لەشکر روبەرووی یەك بوونەوە، ئەخشنوار پشتی بەپەیمانەکانی نێوانیان بەست و لەئەنجامی پەیمان شکێنی ئاگاداری کردەوە. فیروز نەگەرایەوە. هاورێکانی ئامۆژگاریان کرد و ئەو نەیبیست و ورەی ئەوانی لەشەر کردن بەلاواز لەقەڵەمدا. ئەخشنوار کەبینی فیروز جگە لەشەر داواکاریتری نییە، نوسخەیەکی لە پەیماننامەکە کردە سەر نوکی رمێك و وتی: خوایە، ئەوی لەناو ئەمەدا نوسراوە بێنەرەدی و بە دواهاتەکاتی گیرۆدەی کە. ئەو لەشەردا خۆراگری کرد و فیروز و سوپاکەی بەقورسی تێکشکان و کاتێك روویان لەخەندەکەکان کرد، ئالاکانیان ون کرد، بە پردەکان نەگەشتن و کەوتنە ناو خەندەکەکان. فیروز و بەشی

زۆری سوپاکەی لەناوچون و ئەخشنوار سامان و چوارپێ و ساز و بەرگی ئەوانی بەتالآنی برد. ئەخشنوار دەستی بەسەر زۆرینەی بەشەکانی خوراساندا گرت. لەم کاتەدا پیاوێك لەفارس بەناوی سوخرا (سوخد) کە لەگەورەکانی ئێران بوو، وەك یەکێك لەفەرمانرەواکان مەبەستی شەڕی هیپتالیەکانی کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبوو بەڵکو فیروز لەکاتی رۆشتن بۆ شەر، ئەوی لەجێگای خۆی دانابوو. ئەو فەرمانرەوای سیستان بوو. سوخرا روبەروی سەرکردەی هیپتالیەکان بوویەوە و شەڕی لەگەڵ کرد و لەخوراسان دەریپەڕاندن و ئەوەی لە لەشکرەکەی فیروز بە تالآنی بردبوویان، وەریگرتەوە، ئەسیرەکانی ئازاد کرد و بۆ ولآت گەراندنیەوە. ئێرانییەکان زۆربە گەورەیان دەزانی بەجۆرێك جگە لەپاشا کەس لەو گەورەتر نەبوو. ولآتی هیپتالیەکان، تخارستان بوو. فیروز لەکاتی وەرگرتنی هاوکاری کردنی ئەم پاشایە، تاڵەقانی پێبەخشی.

پاشایەتی فیروز بیست و شەش ساڵ یا بیست و یەك ساڵی خایاند.

## رووداوەکانی سەرزەمینی عەرەب لە رۆژگاری فیروز و یەزدگێرد

خزمەتی پاشاکانی حەمیر کورەکانی ئەشراف لەحەمیر و کەسانیتر دەیانکرد. یەکێك لەو کەسانەی خەزمەتی حسان کوڕی توبەعی دەکرد، عەمرۆ کوڕی حەجەری کێندی، سەروەری هۆزی کێندی بوو. کاتێك عەمرۆ کوڕی توبەع براکەی خۆی حسان کوڕی توبەعی کوشت، عەمرۆ کوڕی حەجەری هەلگرت و پەروەردەی کرد و کچی براکەی خۆی حسانی پێدا. کەس لەعەرەب بوێری خوازبێنی کردنی لەوان نەبوو. ئەو ژنە، حارس کوڕی عەمرۆی هێنایە دنیا. دوای عەمرۆ کوڕی توبەع، عەبد تەلال کوڕی مسەوەب بەپاشایەتی گەشت. لەبەر ئەمە ئەویان وەك پاشا دەستنیشانکرد چوونکە منالەکانی عەمرۆ کەم تەمەن و منالْ بوون. پێشتر پەرییەکان توبەع کوڕی حسانیان فریو و عەقلی ئەویان رفاندبوو. عەبد تەلال لەسەر ئایینی مەسیحی یەکەم بوو و ئایینەکەی خۆی دەشاردەوە. توبەع کوڕی حسان لەنەخۆشی رزگاری بوو. ئەو زاناترین خەلکان لەرووداوەکانی پێش خۆی بوو. بووە پاشای یەمەن و حەمیرییەکان ترسیان ئەویان لێ نیشت. کوڕی خوشکەکەی حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی حەجەری لەگەلْ سوپایەك بۆ حیرە نارد و ئەم سوپایە شەڕی نەعمان کوڕی ئەمرۆ القیسی (کوڕی شەقیقەی) کرد و نەعمان ژمارەیەك لەکەسان و خزمەکانی خۆی کوشت. مونزەر کوڕی نەعمانی گەورە (کە دایکی ماالسما- ناوی ئاسمان- بوو) لەمەرگ رزگاری بوو. دایکی ژنێك لەهۆزی نەمێری کوڕی قاست بوو. بەم شێوەیە پاشایەتی بنەمالەی نەعمان لەناوچوو و حارس کوڕی عەمرۆ کەنەدی بووە پاشای ئەوان. دەستەیەك لەزاناکان ئاماژەیان بەم رووداوە داوە.

کوڕی کەلبی دەلێت: دوای نەعمان، مونزەر کوڕی نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی نەعمان بەپاشایەتی گەشت و چل و چوار سالْ فەرمانرەوایەتی کرد: لەرۆژگاری بەهرامی گور هەشت سالْ، لەرۆژگاری یەزدگێرد کوڕی بەهرام هەژدە سالْ و لەرۆژگاری فیروز کوڕی یەزدگێرد دەسالْ. دوای ئەو ئەسوەد کوڕی مونزەر بیست سالْ پاشایەتی کرد: لەرۆژگاری فیروز کوڕی یەزدگێرد دە سالْ، لەرۆژگاری بلاش کوڕی فیروز چوار سالْ و لەرۆژگاری قوباد کوڕی فیروز شەش سالْ.

ئەبوو جەعفەر لێرەدا بەمشێوە ئاماژەی پێداوە: حارس کوڕی عەمرۆ، نەعمان کوڕی ئەمری القیسی کوشت و وڵاتەکەی داگیر کرد و پاشایەتی لەبنەماڵەی ئەودا نەما. لەشوێنێك پێشتر لەمە وتوویەتی مونزەر کوڕی نەعمان یا نەعمان (بەپێی جیاوازی ئاماژە پێدراو) ئەو کەسە بوو لەشکری کۆکردەوە و بەهرامی گوری کردە پاشای ئێران. ئەو دواتر ئاماژەی بەپاشاکانی حیرە لەمناڵەکانی نەعمان تا دوایین کەس داوە. پاشایەتی ئەوان بەعەمرۆ کوڕی حارس کۆتایی نەهات. هۆکارەکەی ئەوە بوو مێژووی عەرەب بەتەواوی نەنوسرابوویەوە و لەبەر ئەمە، هەر کەس هەمان گێرانەوەی گێڕاوەتەوە کەبیستوویەتی.

جیاواز لەمانەیشیان وتووە کە بەخواستی خوا لەداستانی کوژرانی حەجەر کوڕی عەمرۆ ئەمرۆ القس ئاماژەی پێدەدەین.

راستییەکەی ئەوەیە پاشاکانی کێندە، عەمرۆ و حارس، لەنەجد، فەرمانڕەوایەتی عەرەبەکانیان کرد. لەخمیەکان کەپاشاکان لەرەچەڵەکی مونزەر بوون، بەردەوام فەرمانڕەوایەتیان کرد تا قوباد بەپاشایەتی ئێران گەشت و ئەوانی لابرد و حارس کوڕی عەمرۆ کێندی کردە فەرمانڕەوایی حیرە. ئەوسا بەهەمان شێوەکە بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین، ئەنەوشیروانی دادپەروەر حیرەی بۆ لەخمیەکان گەڕاندەوە.

## پاشایەتی بلاش کوڕی فیروز کوڕی یەزدگێرد

دوای فیروز، کورەکەی بلاش بەپاشایەتی گەشت و لەنێوان ئەو و براکەی قوباد ئاژاوە رویدا کەسەرکەوتنی قوبادی لێکەوتەوە و بوو بەپاشا. کاتێك بلاش هاتەسەر کار، رێزی لەسوخرا گرت و بۆ رێز لێنان لەخزمەتەکانی، چاکەی لەگەڵدا کرد. ئەو گەورە و رێزدار و خوازیاری ئاوەدانی بوو. ئەگەر دەیبیست ماڵێك دارماوە و خاوەنەکانی باریان کردووە، کوێخای ئەو شوێنەی سزا دەدا کەبۆ هەژاری ئەو داماوەی چارەسەر نەکردووە تا ناچار بەکۆچ کردن لەزادگاکەی خۆی نەبێت. ئەو شاری ساباتی لەنزیك مەداین دروست کرد. رۆژگاری پاشایەتی ئەو چوار ساڵی خایاند.

## پاشایەتی قوباد کوڕی فیروز کوڕی یەزدگێرد

پێش ئەوەی قوباد بەپاشایەتی بگات، رۆشتبوویە لای خاقان تا بۆ شەڕ دژی براکەی هاوکاری لێوەربگرێت. ئەو هاورێ لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوەڵانی خۆی بەنهێنی لای نەیشاوەرەوە تێپەری و زەرمێهر کوڕی سوخرا لەگەڵیان بوو. گیانی خوازیاری پەیوەندی هاوسەریەتی و ئەم نهێنیەی لەگەڵ زەرمێهردا باس کرد و داوای ژنی لێکرد. زەرمێهر رۆشتە لای خاوەنی ماڵ کە لەئەسواران و کچێکی زۆر جوانی هەبوو. زەرمێهر داوای کچی لێکرد و مژدەی خۆشی بەژنەکەی دا و ئەو کچەکەی بەقوباد دا کە هەمان شەو هاتەلای و کچ بە ئەنەوشیروان دووگیان بوو. قوباد دیارییەکی گرانبایی بەکچەکەدا و ئەوی بۆماڵی باوکی گەراندەوە. دایکی چۆنیەتی کاری قوبادی لەکچەکەی پرسی و کچ وڵامی دایەوە هیچ لەکاروباری ئەو نازانێت جگە لەوەی بینیویەتی شەرواڵەکەی بەزێرچنراوە. دایك زانی قوباد لەشازادەکانە. لەم کاتەدا قوباد رۆشتە لای خاقان و دژی براکەی داوای هاوکاری کرد. چوار ساڵ لای مایەوە و بەردەوام مزگێنی هاوکاری دەبیست. سەرئەنجام، خاقان سوپایەکی لەگەڵدا نارد. کاتێك قوباد گەشتە نزیکی ئەو شوێنەی ژنەکەی لەوێ بوو،

پرسیاری کرد و ژنیان هاورێ لەگەڵ ئەنەوشیروان هێنا و هاوسەرەکەی پێی وت ئەمە منالی تۆ ئەنەوشیروانە. لێرەدا هەواڵیان پێدا براکەی بلاش مردووە. قوباد بەپیرۆزی زانی و ئەوی لەگەڵ دایکی سواری گەردونەیەکی شایانە کرد و بەڵێنی پاشایەتی دوای خۆی پێدا و سوخرای کردە کەسە تایبەتەکانی خۆی و سپاسی خزمەتی کورەکەی، زەرمێهری کرد. سوخرا جڵەوی کارەکانی گرتە دەست و خەڵك شوێنی کەوتن و قوبادیان بەسوك زانی. قوباد نەیتوانی بەرگەی ئەمە بگرێت. ئەو بۆ شاپووری رازی کەئیسپەهبۆدی پانتایی کێوەکان بوو، نامەی نوسی و ئەوی لەگەڵ سوپاکەی بانگ کرد. شاپووری رازی هات و قوباد ئاگاداری کردەوە کە مەبەستی کوشتنی سوخرای هەیە. فەرمانی پێدا ئەم نهێنیە دەبێت نهێنی بێت. رۆژێك شاپوور هاتە لای قوباد و سوخرا لای ئەو بوو. ئەو کەمەندێکی لەملی سوخرا توند کرد و بردیە زیندان. قوباد ئەوی خنکاند و ناردی بۆ کەسەکانی و لەجیاتی ئەو پێگەی بەشاپووری رازی بەخشی وپێشی خست.

لەرۆژگاری ئەو مەزدەك دەرکەوت و ئایینێکی تازەی هێنا. لەدەستەیەك بابەت هاوباوەری زەردەشت بوو، هەندێ شتی لەئایینکەی ئەو کەم کردەوە و شتی پێ زیاد کرد. گومانی دەکرد خەڵك بۆ سەر ئایینی ئیبراهیمی خەلیل بانگ دەکات بەهەمان شێوە کەزەردەشت لەزەمانی خۆی ئەم کارەی دەکرد.

پەیوەندی هاوسەریەتی لەگەڵ نزیکەکان (وەك خوشك و دایك و کچی پور و ئامۆزا و خاڵۆزای) بەرەوا زانی و کارە حەرامەکانی لەسەر خەڵك حەلاڵ کرد. لەسامان و زەوی و زار و ژن و کەنیز و کۆیلە هاوسەنگی لەنێوان خەڵکان دروست کرد بەشێوەیەك هیچ کەس بەهیچ جۆرێك لەپێشی بەسەر کەسانیترەوە نەبێت. شوێنکەوتوانی لەکۆمەڵی هەزاران زیادیان کرد و گەشتنە دەیان هەزار کەس. مەزدەك ژنی ئەمی دەگرت و دەیدا بە یەکیتر و ئەم کارەی لەسامان، کەنیز و کۆیلەکان و نیازەکانیتر وەك کشتوکاڵ و ماڵ و بێستان و باغ دەکرد. ئەو بەسەر وڵاتدا زاڵ ، پێگەی بەرز و قوباد باوەڕی پێ هێنا. رۆژێك بەقوبادی وت: ئەمرۆ سەرەی منە لەگەڵ ژنەکەی تۆ، دایکی ئەنەوشیروان بخەوم. قوباد ژنەکەی خۆی بەودا. ئەنەوشیروان هەستا، پێلاوەکانی لەقاچی مەزدەك داکەند و هەر دوو قاچی

ماچ کرد و داوای لێکرد دەست بەسەر سامانەکانیتردا بگرێت بەڵام با زاری خۆشەویستی دایکی نەدۆرێنێت. مەزدەك وازی لێهێنا.

ئەو سەرپڕینی ئاژەڵی بە نارەوا زانی و وتی: ئەوەی زەوی دەیروێنێت یا ئەوی ئاژەڵەکان بەدیدێنن (وەك هێلکە و شیر پەنیر و رۆن ...)بۆ خەڵك بەسە. بارودۆخ لەسەر خەڵك دژوار بوو بەشێوەیەك کەس نەباوکی خۆی دەناسیەوە نەکورەکەی.

کاتێك دە ساڵ لە پاشایەتی قوباد تێپەری، موبیدەکان و گەورەکان کۆبوونەوە و ئەویان لەپاشایەتی لابرد و لەجیاتی ئەو براکەی جاماسبیان دانا و بەقوبادیان وت: تۆ بەهۆی باوەڕ هێنان بەمەزدەك گوناحکار بوویت و لەگوناحی هاوەڵانی مەزدەك و هەڵس و کەوتی ئەوان لەگەڵ خەڵك شەریکیت. جگە لەمەتۆ رزگار ناکات کەژن و منداڵەکانت بخەیتە بەردەست خەڵك. دەیانویست خۆی بەدەست ئەوان بدات تاسەرِی ببرن و هاوشێوەی قوربانی بیسوتێنن. ئەو ئەم کارەی نەکرد و ئەوان زیندانیان کرد بەشێوەیەك دەستی کەسی پێنەدەگەشت. زەرمێهر کوڕی سوخرا هاتەدەر و ژمارەیەکی زۆر لەمەزدەکیکانی کوشت و قوبادی بۆ پاشایەتی گەراندەوە و براکەی جاماسبی لەسەر کار لابرد. قوباد دوای ئەوە زەرمێهری کوشت.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك قوباد خرایە زیندان و براکەی جێگەی گرتەوە، یەکێك لەکچەکانی هاتە لای و وای نیشاندا دەیەوێت چاوی پێیبکەوێت. ئەوسا لەفەرشێکییەوە پێچا و کۆیلەیەك هەڵیگرت. کاتێك لەزیندان هاتەدەر، زیندانوان پرسی چی پێیە؟ کچ وتی: جێگایەکە رۆژانی نەخۆشی مانگانەی خۆم لەناو ئەوەدا بەسەر دەبەم. زیندانوان دەستی لێنەدا. کۆیلە قوبادی هێنایەدەر و رایکرد و پەیوەستی پاشای هیپتالیەکان بوو و داوای هێزی شەرکەری لێکرد تا دووبارە دەست بەسەر پاشایەتی خۆیدا بگرێتەوە. کاتێك بەئێرانشار یانی نەیشابوور گەشت، رۆشتە لای یەکێك لەخەڵکانی ئەو شارە کەکچێکی جوانی بوو. ئەوی کردە هاوسەری خۆی کەهەمان دایکی ئەنەوشیروانی دادپەروەرە. ژن هێنانی ئەم لەم رۆشتنەی دابووە نەك لەویتریان. ئەمە وتەی دەستەیەك لەمێژوونوسانە. ئەو گەرایەوە و ئەنەوشیروانی لەگەڵدا بوو. بەسەر براکەی جاماسبدا زاڵبوو و تاج و تەختی پاشایەتی وەرگرتەوە. دوای ئەوە قوباد رۆشتە شەری رۆمەکان و شاری ئامێدی گرت

و شارەکانی ئەرجان و حیلوانی دروست کرد و ماڵئاوایی لەدنیا کرد. دواى ئەو کورەکەی خوسرەوی ئەنەوشیروان هاتەسەر کار. رۆژگاری پاشایەتی قوباد لەگەڵ پاشایەتی براکەی چل و سێ سالی خایاند. خوسرەوی ئەنەوشیروان فەرمانرەوایەتی لەسەر ئەوی باوکی بۆی دیاری کردبوو، گرتەدەست.

لەرۆژگاری ئەو، خەزەریەکان هاتنەدەر و پەلاماری ئێرانیاندا و گەشتنە دینەوەر. قوباد یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی هاورێ لەگەڵ دوانزە هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ روبەروبوونەوەی ئەوان نارد. ئەو لەسەرزەمینەکانی ئەوان تێپەری کرد و ناوچەکانی نێوان روبارێکی ناسراو بەناوی (رەس)(ئەرەس) تا شەروانی گرت. دواتر قوباد پەیوەستی بوو و لەسەرزەمینی ئەران بناغەی دوشاری بیلقان و بردعەی دارشت و دروستی کرد. ئەم دوو شارە و شارەکانی دەوروبەری هەموویان شارە سنورییەکان بوون. خەزەرەکان لەحاڵی خۆیاندا مانەوە. ئەوسا قوباد بۆ ئالانەکان لەنێوان سەرزەمینی شەروان و ئالان، ئاوبەندێك و چەندین شاری دروست کرد کەهەموویان دوای دروست بوونی دەروازەی دەروازەکان (باب الابوواب) رویان لەوێرانی کرد.

## ڕوداوەکانی عەرەب لەڕۆژگاری قوباد

کاتێك حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی حەجەری کێندی بووە پاشای عەرەب و نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی ئەمری القیسی (وەك ئاماژەمان پێدا) کوشت، قوباد نامەی بۆنوسی: لەنێوان ئێمە و پاشاکەی پێش تۆ پەیمانێك بوو و خوازیاری بینینی تۆم. قوباد پیاوێکی دوور ئەندێش کەچاکەی لەخۆی نیشان دەدا و لەخوێن ڕشتن خۆی دەپاراست و لەگەڵ دوژمنان بەنەرمی هەڵس و کەوتی دەکرد. حارس ڕۆشتە سەردانی. ئەو دووانە یەکیان بینی و پەیمانی ئاشتیان بەست لەسەر ئەو بنەمایەی هیچ عەرەبێك لەڕوباری فورات تێپەر نەبێت. حارس چاوی تەماحی بڕییە سەرزەمینی ئێران و فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا لەفورات تێپەڕن و هێرش بکەنە سەر سواد. قوباد ئەم هەواڵەی پێگەشت و زانی هۆکاری ئەم کارە، بزوێنەرەکەی حارسە. بانگی کرد و کاتێك حارس هات، پێی وت: ڕێگران لەعەرەب ئەم و ئەوەیان کرد. حارس وتی: من لەم کارە بێ ئاگا بووم و تەنیا بەزێر و لەشکر دەتوانرێت ڕێگری لەعەرەبەکان بکرێت. ئەو داوای بەشێکی سوادی لەقوباد کرد. قوباد شەش تسوج (پانتایی) لەسوادی بەحارس بەخشی. لەولا، حارس پەیك و پەیامی بۆ توبەع پاشای یەمەن نارد و تەماحی سەرزەمینەکانی ئێرانی خستە بەرچاو. توبەع بەرێکەوت و لەحیرە دابەزی و برازاکەی خۆی شەمیر زوالجەناح ڕەوانەی شەڕی قوباد کرد. قوباد خۆراگری کرد بەڵام شەمر تێکی شکاند تا گەشتە ڕەی و ئەوسا لەوێ خۆی پێگەیاند و ئەوی کوشت. دواتر توبەع برازاکەی خۆی شەمر زوالجەناحی بۆ خوراسان و کورەکەی حسانی بۆ سەغد نارد و وتی: هەرکام لەئێوە بەچین بکات فەرمانرەوایی ئەوێ بێت. هەرکام لەو دووانە سوپایەکی گەوە و مەزنی لەگەڵدابوو کەدەستەیەك دەڵێن ژمارەی سوپاکەیان بەشەشسەد و چل هەزار کەس دەگەشت. ئەو کوڕی براکەی یەعفەری ڕەوانەی ڕۆم کرد و ڕۆمیەکان ملکەچی بوون و باجیان پێدا. یەعفەر ڕۆشت و گەشتە ڕۆمیە و گەمارۆی دا. هاوەڵانی گیرۆدەی تاعون بوون. ڕۆمیەکان هێرشیان کردە سەریان و کوشتاریان کردن بەشێوەیەك یەك کەس لەوان گیانی بەدەر نەبرد.

شەمر زوالجەناح بەرەو سەمەرقەند ئەسپی غاردا و گەمارۆی خستە سەر بەلأم نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت. ئاگادار بوویەوە کەفەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە پیاوێکی نەزانە و کچێکی هەیە کەحڵەوی کارەکان لەدەست ئەودایە و کاروبارەکان هەڵدەسورێنێت. شەمر بۆ ئەو کچە دیاری گرانبایی نارد و پەیامی دا: من بۆ ئێرە هاتووم تا پەیوەندی هاوسەریەتی لەگەڵ تۆدا ببەستم. چوار هەزار سنوقی زێر و زیوم پێیە، هەمووی بەتۆ دەدەم و بەرەو چین دەڕۆم. ئەگەر ببمە پاشا تۆ دەبیتە شاژن و ئەگەر مردم زێر و زیو بۆ تۆیە.

کاتێك پەیك و پەیامی بەکچەکە گەشت وتی: وەلأمم دایەوە، زێر و گەوهەرەکە بنێرێت. ئەو چوار هەزار سنوقی نارد. لەناو هەر سنوقێك دوو پیاو حەشار درابوون. سەمەرقەند دو دەروازەی هەبوو و لەسەر هەر دەروازیەك دوو هەزار پیاو پاسەوانیان دەکرد. ئەو لەنێوان خۆی و ئەوان نیشانەی دانا تا دەنگی زەنگ بەرز بکەنەوە. کاتێك پیاوەشەرکەرەکان هاتنە ناوشار، شەمر لەناو خەڵکدا جاریدا و دەنگی زەنگەکە بەرز بوویەوە. پیاوەکان لەناو سنوقەکان هاتنەدەر و دەروازەکانیان گرت. شەمر هاتە ناوشار و خەڵکەکەی کوشتار کرد و هەموو سامانەکانی تالأن و دەستی بەسەردا گرت و بەرەو چین بەرێکەوت. تورکەکانی تێکشکاند و رۆشتە ناو ولأتەکەیان و چاوی بەحسان کوڕی توبەع کەوت و بینی سێ ساڵ پێش لەو گەشتۆتە ئەو ولأتە. ئەو دووانە لەوێ مانەوە تا ئەوکاتەی مردن. رۆژگاری مانەوی ئەوان لەوێ، بە پێی ئەوەی وتویانە، بیست و یەك ساڵی خایاند. دەستەیەك دەڵێن: ئەو دووانە گەڕانەوە و لەرێگی گەرانەوە لای توبەع تێپەرین و تالأنی و دیلی زۆر و زێر و زیویان خستە بەردەم و دواتر هەموویان بۆ سەرزەمینی خۆیان گەرانەوە. توبەع لەیەمەندا مرد و دوای ئەو هیچ کەس لە یەمەن بۆ شەر نەهاتەدەر.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو باوەڕی بەئایینی جوولەکە هێنا. رۆژگاری پاشایەتی ئەو سەد وبیست و یەك ساڵی خایاند.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: توبەعیتر، تەبان ئەسعەد ئەبوکەرب، کاتێك ولأتەکانی داگیر کرد و لەرۆژهەلأت زەمین گەرایەوە، کەوتە سەر رێگەی مەدینە. کاتێك لەسەرەتا لەم شارە تێپەری، خەڵکەکەی ئازار نەدا و یەکێك لەکورەکانی خۆی لەم

شارە بەجێهێشت. ئەم کورە بەشێوەیەکی کتاوپڕ و شاراوە کوژرا. تەبان روی کردە شارەکە و مەبەستی وێران کردنی شارەکە و کوشتاری خەڵکی کرد. کاتێك ئەنسار ئەمەیان بیست بەفەرماندەیی سەرۆکەکەیان عەمرۆ کوڕی تەلە یەکێك لەکورەکانی عەمرۆ کوڕی مەبزول لە منالەکانی نەجار، کۆبوونەوە و بڕیاری بەرگرییاندا. ئەوان رۆژانە شەڕیان لەگەڵ دەکرد و شەوانە پاسەوانیان دەدا. لەوێ بوو تا ئەوەی دو دیندار(خاخام) لەمنالەکانی قورەیزە کەپیاوێکی زانا و بیرمەند بوون، هاتنە لای و پێیان وت: بیستومانە دەتەوێت چی بکەیت؟ ئەگەر لەسەر ئەم کارە پێداگری بکەیت، رێگەت لێدەگرن و دەترسین بەم زووانە ئەشکەنجەیەك بەسەر تۆدا دابارێت. وتی: بۆ؟ وتیان: ئێرە شوێنی کۆچی پێغەمبەرێك لەقورەیشە کەدەیکاتە شوێنی مانەوەی خۆی. ئەو لەوتاری ئەوان سەری سورما و دەستی لەکارەکەی خۆی هەڵگرت و بووە شوێنکەوتەی دینەکەی ئەوان. ناوی ئەو دووانە کەعب و ئەسەد بوو. توبەع و خەڵکەکەی بتپەرەست بوون. ئەو لەمەدینە رۆشتە مەککە. کەعبەی بەپارچە و پەردەی چنراوی یەمەن داپۆشی و یەکەم کەس بوو ئەم کارەی کرد. درگا و کلیلی بۆ دروست کرد و کاتێك هاتەدەر و روی کردە یەمەن خەڵکی خۆی بۆ سەر ئایینی یەهودی هاندا. ئەوان رازی نەبوون و داوەریان بردە لای ئاگر. ئەوان ئاگرێکیان بوو لەنێوان ئەواندا داوەری دەکرد و بەگومانی ئەوان ستەمکاری دەخوارد و ستەملێکراو بێ زیان دەهاتەدەر. بەخەڵکەکەی خۆی وت: دادپەروەریتان کرد. خەڵکەکەی لەگەڵ بتەکانیان هاتەدەر و ئەو دوو کاهینە هاتن و کتێبە ئاسمانیەکانیان لەدەستا بوو. هەموویان لەشوێنی ئاگرەکە کۆبوونەوە. ئاگر بڵێسەی سەند و ئەوانی گرتەوە و بتەکانی هاورێ لەگەڵ قوربانییەکان و خاوەنانی بت لەپیاوانی حەمیری خوارد. ئەو دوو کاهینە هاتنەدەر و لەناوچاوانیان ئارەق دەتکا و ئاگر زیانی لێنەدان. خەڵکی حەمیر یەك دڵ و یەك زمان باوەڕیان هێنا.

پێشتر کاهینێك بەناوی شافیع کوڕی کولەیب سەدەفی هاتبووە لای توبەع. توبەع پێی وت: ئایا مەزنییەك بەمەزنی پاشایەتی من دەناسی؟ وتی: نە مەگەر ئەوەی پاشای غەسانە. وتی: ئایا لەو زیاتر مەزنی دەناسی کەلەویش زیاتر بێت؟ وتی: دەناسم بۆ فەرمانرەوایی چاکەکار، هاوکاری گەشتو لەلایەن خوا، وەسف کراو

لە(زەبوور) بەهەڵس و کەوتی بەرز، خەڵکەکەی لەپێش هەموو خەڵکانەوەن لەهەر نوسراوێکدا، تاریکی لەناودەبات بەروناکی روخسار، ناوی ئەحمەدە پێغەمبەری گەورە، خۆش بەحاڵی خەڵکەکەی ئەوکاتەی بۆ پێغەمبەری دەنێردرێت بۆ لای ئەوان لەلایەن خوا، یەکێك لەمناڵەکانی (لوی)ە بەرەچەڵەك و یەکێك لەمناڵەکانی (قوسەی) بەناچاری. خەڵك لەزەبووریان روانی و ئەم وەسف کردنانەیان لەپێغەمبەری ئیسلامدا بینییەوە.

دوای ئەم توبەعە کەهەمان تەبان ئەسعەد باوکیکەرب کوڕی ملکیکربە، رەبیعە کوڕی نەسری لەخمی بووە پاشای عەرەب. کاتێك رەبیعە مرد، پاشایەتی یەمەن بەحسان کوڕی تەبان ئەسعەد گەشت.

کاتێك رەبیعە بەپاشایەتی گەشت، خەوێکی بینی و پەرێشانی کرد. هیچ کاهین و جادوگەرێك و فالگرێکی نەهێشت مەگەر ئەوەی بانگی کرد. بەوانی وت: خەوێکم بینیوە و پەرێشانی کردووم، لێکدانەوەکەییم پێ بڵێن. وتیان: بۆمان بگێرەوە. وتی: ئەگەر بیگێرمەوە باوەر ناکەم راستیەکانم پێ بڵێن. کاتێك ئەمەی وت، یەك لەوان هاتە پێش و وتی: ئەگەر پاشا ئەمەی دەوێت دەبێت کەسێك بۆ هێنانی (شەق) و (سەتیح) بنێرێت. لەوان هەرچی بپرسی بەراستی وەڵامت دەدەنەوە. ناوی سەتیح رەبیعە کوڕی رەبیعە (کوڕی مەسعود کوڕی مازن کوڕی زەئب کوڕی عودەی کوڕی غسان بوو) و پێیان دەوت زەئبی چوونکە لەنەژادی زەئب کوڕی عودەی کوڕی غسان بوو. ئەویتریان شەق کوڕی مەسعەب کوڕی یەشکر کوڕی ئەنمار بوو.

ئەو کەسی بەدوای ئەواندا نارد. سەتیح پێش شەق هات. ئەوی لەخەوەکەی خۆی ئاگادار و پرسیاری لێکرد. سەتیح وتی: سەرێکت بینی لەتاریکیەوە هات و لەسەرزەمینێکی تاریك رۆچو و خاوەنی هەر سەرێك دەخوات. پاشا وتی: کەم و کوڕی نەبوو، چۆن لێکی دەدەیتەوە؟ سەتیح وتی: سوێند دەخۆم بەهەموو بەرهەمە گازگرەکان کەلەنێوان دوو سەرزەمیندان، بێ گومان حەبەشیەکان دێنە ناو ولآتەکەی ئێوە و لەئەبین تا جەرەش دەگرن. پاشا وتی: سوێند بەباوکت ئەی سەتیح ئەمە لێکدانەوەیەکی بەئازار و مەترسیدارە. کاتەکەی کەیە، لەرۆژگاری منە یا دوای من؟ وتی: زەمانێك دوای ئەوە، شەست ساڵ تێپەر دەبێت یا حەفتا ساڵ. پاشا پرسی: ئایا

پاشایەتی ئەوان سەقامگیر دەبێت یا دەروخێت؟ سەتیح وتی: کاتێك حەفتا و چەند ساڵ تێپەڕێت، دەروخێت و هەڵدەوەشێتەوە. ئەوسا هەموویان دەرۆن و هەڵدێن. پاشا وتی: بەدوای ئەو کێ دێت؟ سەتیح وتی: پیاوێك بەناوی ئەرەم زی یەزن کە هێرش دەکاتە سەر ئەوان لەعەدەن و کەس لەوان بەزیندوویی ناهێڵێت لەیەمەن. پاشا وتی: ئایا پاشایەتی ئەو بەردەوام دەبێت یا دەروخێت؟ سەتیح وتی: دەروخێت. دەیروخێنێت ئەو پێغەمبەرەی پەیام دێتە دڵی لەیەزدان بۆ دادپەروەری. ئەو پیاوێکە لەمناڵەکانی غالب کوڕی فەهر کوڕی مالك کوڕی نەسری جەهاندار کەخەڵکی ئەو پاشایەکیان دەبێت تا کۆتایی دنیا. پاشا پرسی: ئایا رۆژگار کۆتایی هەیە؟ سەتیح وتی: بەڵێ کۆتاییەکەی رۆژێك دەبێت کەکۆدەبنەوە پێشینیان و داهاتووان، بەختەوەر دەبن چاکەکاران و بەدبەخت دەبن خراپەکاران. پاشا وتی: ئەی سەتیح، ئایا راستی بەمن دەڵێیت؟ سەتیح وتی: سوێند بە تاریکی و بەرەبەیان، بە بوومەلێڵ کە دێت لەناکاو، ئەوەی وتم راست و ڕەوایە ئەی پاشا.

کاتێك شەق هات، پاشا وتی: ئەی شەق خەوێکم بینیوە پەرێشانی کردووم. لێکدانەوەی بۆ بکە. پاشا شەقی لەلێکدانەوەکەی سەتیح ئاگادارنەکردەوە بۆ ئەوەی بزانێت ئایا وتەکانیان وەك یەکە یا نە. شەق وتی: بەڵێ، سەرێکت بینی لە تاریکیەوە هاتەدەر و رۆشتە ناو بێستان و تەپۆڵکەیەك و خاوەنی هەر سەرێك لەناو دەبات.

کاتێك پاشا ئەمەی بیست وتی کەم و کوڕی نەبوو، لێکدانەوەکەی چییە. شەق وتی: سوێند دەخۆم بەهەر شتێك لەناو دوو سەرزەمیندا هەیە لەمرۆڤ دێنە سەر ولاتەکەی ئێوە سوپاییەکان و داگیری دەکەن لەئەبین تا نەجران. پاشا وتی: بەگیانی باوکت ئەی شەق بەئازارە! کاتەکەی کەی دەبێت. دوای تۆ بە ماوەیەك، رزگار دەکات ئێوە لەوان پیاوێکی گەورە، سوك و ریسوایان دەکات، نەپیاوێکی پەستە و نەگوناحکار و لەناو بنەماڵەی زی یەزن دێت بەبەهێزی. پاشا وتی: ئایا پاشایەتیەکەی بەردەوام دەبێت یا دەروخێت؟ شەق وتی: دەروخێت لەسەردەستی پێغەمبەر نێردراوی راستی، کەدادپەروەری بلاو دەکاتەوە، پیاوی دین دەبێت و گەورە بێ کەم و کوڕی، بۆ خەڵکەکەی دەبێت پاشایەتییەکەی بەردەوام تا رۆژی

کۆتایی کە لەناو دەبات ژیانی هەمووان. پاشا وتی: ڕۆژی کۆتایی کامەیە. شەق وتی: ڕۆژێك پاداشت و سزا وەردەگرن فەرمانڕەواکان، بانگ دەکەن خەڵك لە ئاسمانەوە. دەبیستن زیندوو و مردوو و دەڕۆنە شوێنی موژدە پێدراو هەموو خەڵکان.

کاتێك لە پرسیار کردن لەم دوانە تەواو بوو، منداڵ و کەسانی خۆی کۆکردەوە و هاتە عێراق و ساز وبەرگ و شتە پێویستەکانیتری بۆ ئەوان هێنا. یەکێك لە پاشماوەکانی ڕەبیعە کوڕی مونزەر، نەعمان کوڕی مونزەر پاشای حیرە بوو کە نەژادنامەی بەم شێوەیە: نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەمری القیس کوڕی عەمرۆ کوڕی عودەی کوڕی نەسر. ئەو هەمان پاشا بوو.

کاتێك ڕەبیعە کوڕی نەسر مرد و پاشایەتی یەمەن بەحسان کوڕی تەبان کوڕی ئەبی کرب کوڕی ملکیکرب کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ زوالازعر گەشت، لەناو ئەو شتانەی حەبەشەی هاندا و پاشایەتی لەحسان سەندەوە، یەك ئەوە بوو کەحسان لەگەڵ خەڵکی یەمەن هاتەدەر و ویستی لەگەڵ ئەوان هێرش بکاتە سەر سەرزەمینەکانی عەرەب و عەجەم بەو شێوەی کەتوبەعەکانی پێش دەیانکرد. کاتێك گەشتە عێراق، هۆزەکانی عەرەب لەیەمەن لەڕۆشتن لەگەڵ ئەو بێزار بوون و لەبەر ئەمە لەگەڵ براکەی عەمرۆ قسەیان کرد تا حسان بکوژن وئەو لەجیاتی دانێن. ئەو ڕازی بوو ئەم کارە بکات بەڵام زورعەینی حەمیر بەم پێشنیارە ڕازی نەبوو و عەمرۆی لەم کارە بە دوور دەگرت. ئەو ئامۆژگاری نەبیست. زورعەین ئەم دو دێرەی لەگەڵایەکدا نوسی و مۆری کرد و بۆ لای عەمرۆی برد و وتی: ئەم گەڵایە لای خۆت بپارێزە:

| | |
|---|---|
| الا من يشتري سهرا بن يوم | سعيد من يبيت قرير عين |
| فاما حمير غدرت و خانت | فمعذرة الاله لذى رعين |

واتاکەی: های! کێیە ئەو بێدارەی خەوێك بەخەوێکی ئارام دەگۆڕێتەوە. بەختەوەرە ئەو کەسەی شەوێك بەدڵی ئارام و چاوانی شادمان ڕۆژ دەکاتەوە. ئەگەر

خەڵکی حەمیر فریویاندا و خیانەتیان کرد، لێبووردنی خوا لەگەڵ زورعەینە کەرێزی لەخواوەند گرت.

کاتێك حسان ئاگادار بوویەوە کەبراکەی لەگەڵ هۆزەکانی یەمەن بۆ رشتنی خوێنی هاودەست بوون بەعەمرۆی وت:

یا عمرو لا تجل علی منیتي — فالملك تاخذه بغیر حشود

واتاکەی: ئەی عەمرۆ، لەمەرگی من پەلە مەکە چوونکە دکرێت پاشایەتی بێ کۆکردنەوەی سوپا بەدەست بێنیت.

عەمرۆ لەسەر کوشتنی ئەو پێی داگرت و سەرئەنجام ئەوی لە(رحبە مالك) کوشت. وەك چۆن دەستەیەك وتویانە، بێرە دەڵێن فرضة نعم. ئەو دواتر بۆ یەمەن گەرایەوە، و خەو وئارامی لێ برابوو. دەردی خۆی بۆ لای پزیشك و هاوشێوەکانی برد و گلەیی دەست پێکرد و لەبێداری نالآندی کەتەنگی پێهەڵچنیوە. یەك لەوان پێی وت: هەر کەس براکەی خۆی بەستەم بکوژێت، خەوی لێ دەگیرێتەوە. کاتێك ئەمەی بیست، هەموو ئەو کەسانەی کوشت کەبۆ کوشتنی براکەی هانیاندابوو، تا گەشتە زورعەین. کاتێك ویستی بیکوژێت وتی: من لای تۆ نوسراوێکم هەیە کەبێ گوناحی من دەسەلمێنێت. پرسی: چییە؟ وتی ئەو نامەی بەتۆم سپارد، بێنە. عەمرۆ نوسراوەکەی دەرهێنا و بینی ئەو دوو دێرەی تیا نوسراوە. ئەو زورعەینی نەکوشت. ئەوندەی نەخایاند عەمرۆ لەناوچوو و حەمیرەیەکان بلآوبوونەوە.

من دەڵێم: ئەم داستانە کە ئەبوجەعفەری تەبەری لەکوژرانی قوباد لەرەی و فەرمانرەوایەتی توبەع بەسەر سەراسەری ولآت لەدوای ئەو، ئاماژەی پێداوە، گێرانەوەیەکی قێزەون و هەڵە بێژییەکەی ئاشکرایە و ناراستییەکانی ئاشکراترە کەپێویست بەباس کردن بکات. ئەگەر نەنەوەی ئێمە بەڵێنمان دابوو هەربەسەرهاتێکی مێژووی بەهەمان شێوە یا بەمانای — بێ کەم و کوڕی — ئاماژەی پێبدەین، باس نەکردنی شیاوتر بوو. ناراستییەکەی لەوەدایە دەڵێت قوباد لەرەی

کوژرا لەکاتێکدا لەناو زاناکانی مێژوو و بەسەرهاتەکان لەنێرانییەکان و جیاواز لەوان، دژایەتی نییە و هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو لەکاتێکی دیاریکراو بەمەرگێکی ئاسایی کۆچی دوایی کرد. ساڵەکانی پاشایەتی ئەویش زانراوە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. کەس – جگە لەم گێرانەوەیە- ئاماژەی بەوە نەداوە کەئەو کوژراوە. کاتێك ئەو مرد، کورەکەی ئەنەوشیروان لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. ئەمە ناودارترین گێرانەوەیە تەنانەت لەشێعری زۆر ناوداری ئەمرۆالقیس ناودارترە کەوتی: ((قفا نبك)).

ئەگەر دوای قوباد، ولاتی ئێران کەوتە دەست حەمیریەکان، چۆن بوو کورەکەی ئەنەوشیروان دوای ئەو بەپاشایەتی گەشت و ناوی شای شاکانی پێبرا. لەفەرمانرەواییدا بەهێز بوو بەشێوەیەك پاشاکانی جیهان فەرمانی ئەویان دەبرد و رۆمیەکان باجیان بۆ دەنارد.

ئەو دەڵێت: توبەع کورەکەی حسانی بۆ چین نارد و شەمری بۆ سەمەرقەند و کوری براکەی بۆ رۆم. ئەو بەسەر کۆنستانتین نۆپێڵ زال و دەستی بەسەردا گرت و دواتر بۆ رۆمیە رۆشت و ئەو شارەی گەمارۆدا. خۆزگە دەمزانی یەمەن و حضرموت چەندە بەربلاو و فراوانن کە ئەم دوسوپایەی تیا بێت: یەکێك لەناو ولات بۆ پاراستنی، یەکێك لەگەڵ توبەع، یەك لەگەڵ حسان کە بۆ ولاتی بەربلاوی وەك چینی بنێرن و لەگەڵ شەرکەرانی ئەوێدا روبەرو ببێتەوە، یەکیتر لەگەڵ براکەی توبەع بۆ شەری شاهەنشایەك وەك خوسەرەو بروات و شکستی پێببێنێت و دەست بەسەر ولاتەکەیدا بگرێت و دواتر شارێکی بەگەورەیی و بەهێزی وەك سەمەرقەند گەمارۆ بدات و سەرئەنجام سوپایەك کەیەعفەر فەرماندەیەکی بگرێتە دەست، بڕواتە شەری پاشای رۆم و شارێکی بەربلاوی وەك کۆنستانتین ئۆپێڵ بگرێت! موسوڵمانان بەو سوپا بێ ئەژمارە بۆ گرتنی کۆنستانتین ئۆپێڵ کەوتنە رەنجێکی گیانبڕ و نەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن لەکاتێکدا یەمەن لەبچوکترینی ولاتە ئیسلامیەکان و لەخۆگری کەمترین دانیشتووانە؟ چۆنە بەشێك لەسوپای یەمەن توانیویەتی ئەو شارە بگرێت. ئەمە شتێکە عەقڵ پێی رازی نابێت و گوێکان نایبیستن.

ئەو زیادی دەکات: پاشایەتی توبەع بەسەر سەرزەمینەکانی ئێران و رۆم و چین و .. دوای کوژرانی قوباد بوو یانی لەرۆژگاری کورەکەی ئەنەوشیروان رویدا لەکاتێکدا کەس بۆچوونی جیاواز نییە کە لەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلام لەرۆژگاری ئەنەوشیروانی دادپەوەرە کەچل و حەوت ساڵ فەرمانرەوایەتی کرد. هەروەها دژایەتی نییە لەوەی کاتێك حەبەشیەکان بەسەر یەمەندا زاڵ بوون، فەرمانرەوایی حەمیرییەکانیان روخاند. دوایین پاشایان زو نواس بوو و دەزانین پاشایەتی حەمیرییەکان پێش زونواس، کەڵێنی تێکەوتبوو. کاروباریان بەشێوەیەك لەیەك پچرابوو کەحەبەشیەکان چاوی تەماحیان بڕییە ئەو وڵاتە و مەبەستی دەست بەسەرداگرتنیان کرد. فەرمانرەوایی ئەوان لەسەر یەمەن لەرۆژگاری قوباد بوو. چۆن دەتوانرێت فەرمانرەوایی لێك هەڵوەشاوەی حەمیرییەکان (لە سەردەمی توبەع خۆی) لە رۆژگاری قوباد بێت و توبەع هەمان کەس بێت کەبەسەر یەمەن زاڵ بووە و قبادی کوشتبێت و پێش زاڵبوونی حەمیریەکان بەسەر یەمەن، دەستی بەسەر وڵاتی قوباددا گرتبێت؟ ئەمە وتارێکی باوەڕپێنەکراوە و روداوی ئەگەری نییە. حەبەشیەکان حەفتا ساڵ یا زیاتر فەرمانرەوایەتی یەمەنیان کرد و روخانی پاشایەتی ئەوان لەم سەرزەمینە، لەکۆتایی پاشایەتی خوسرەو ئەنەوشیروان روویدا. ئەمە داستانێکی ناودارە و بەسەرهاتی سیف کوڕی زی یەزن تیایدا لەکەس داپۆشراو نییە. یەمەن دوای حەبەشیەکان بەردەوام لەدەست ئێرانییەکاندا بووە تا موسوڵمانەکان هاتن و دەستیان بەسەرداگرت. چۆن دەتوانرێت پاشایەتی توبەع لەسەر سەرزەمینەکانی ئێران و پاشایەتی حەمیریەکانیتر دوای ئەو پاشایەتی حەبەشیەکان، هەموویان لەرۆژگاری چل و چەند ساڵەی خوسرەو ئەنەوشیروانی دادپەوەردا بووبێت؟ ئەمە سەرسورهێنەرترە کەرۆژگارێك کەبەشێکی حەفتا ساڵە، پێش لەچل و چەند ساڵ تێپەرێت. ئەگەر ئەبو جەعفەری تەبەری بیری لەوتارەکەی خۆی دەکردەوە، لەباس کردنی شەرمی دەکرد.

سەرسورهێنەرتر ئەوەی کەدەڵێت: دوای ئەم توبەعە، رەبیعە کوڕی نەسری لەخمی هاتەسەر کار لەکاتێکدا باوەگەورێی عەمرۆ کوڕی عودەی خوشکە زای جەزیمە بوو و پاشایەتی عەمرۆ لەسەر حیرە، دوای خاڵۆی جەزیمە لەسەردەمی

پاشای تیرەکان و نەوەد و پێنج ساڵ پێش لەپاشایەتی ئەردەشیری بابەکاندا بووە. لەنێوان ئەردەشیر و قوباد نزیکەی بیست پاشا فەرمانڕەوایەتیان کرد. چۆن دەتوانرێت باوەگەوریی عەمرۆ دوای قوباد فەرمانڕەوایەتی کردبێت لەکاتێکدا ئەو رۆژگارێکی دوور ودرێژ لە پێش ئەو بووە؟ ئەگەر ئەبوجەعفەر ئەم رووداوەی لەژێر ناوی (ئاماژەدان بە رووداوەکانی سەردەمی قوباد) نەدەهێنایەوە، دەکرا چارەسەرێکیان بۆ بدۆزینەوە. ئەو بەمە بەسەندەی نەکردووە بەڵکو دوای ئاماژەدان لەرۆشتنی توبەع، وتویەتی: ئەو قوبادی کوشت و بوو بەفەرمانڕەوایی وڵاتەکەی.

بەڵام کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەو کەسەی لەشکری بۆ رۆژهەڵات نارد، دوایین توبەع بوو. مەبەستەکەی لەدوایین توبەع ئەوەیە کەبەرەو رۆژهەڵات لەشکری کێشا و سەرزەمینەکانی گرت. کوڕی ئیسحاق و هاورێکانی دەڵێن: ئەو کەسەی بووە پاشای وڵاتانی رۆژهەڵات زەمین دوای ئەو، بەدوای خۆی چەندین توبەعی بوو کەپاشایەتییان گرتەدەست و ئەوسا بارودۆخی وڵاتیان بۆ رۆژگارێکی درێژ شڵەژا بەشێوەیەك حەبەشیەکان چاوی تەماحیان تێبڕین و بەرەو یەمەن بەرێکەوتن. خۆزگە کەسێك ئەمەی بەراوەرد دەکرد کەئەگەر ئەم توبەعە لەسەردەمی قوباد دابووە، دەبێت دوایین توبەع کەیەمەن لەو سەندرایەوە، لەرۆژگاری نۆمەویەکاندا بێت. فەرمانڕەوایی حەبەشیەکان لەسەر یەمەن، دەبوو ماوەیەك دوای هاتنە سەر کاری عەباسییەکان و سەرەتای ئیسلامیش لەسێسەدەمین ساڵی پاشایەتی ئەوان دەستی پێدەکرد تا ئەمە وتەیە بتوانێت جێگەی خۆی بکاتەوە.

ئەو بەدوای ئەمەدا دەڵێت: عەمرۆ کوڕی تەلەی ئەنساری روبەرووی توبەع بوویەوە لەکاتێکدا دەستەیەك دەڵێن: ئەم عەمرۆیە ژیا و لەسەردەمێك کەپیرەپیاوێکی بەتەمەن بوو، چاوی بەپێغەمبەری ئیسلام کەوت و دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر لەشەری بەدر گیانیدا. یەکێك لەهێماکانی ناراستی ئەم گێڕانەوەیە ئەوەیە کاتێك موسوڵمانەکان مەبەستی سەرزەمینی ئێرانیان کرد، ئێرانییەکان بەردەوام لەنامە نوسین و گفتوگۆکانیان لەزەمانی شەڕ دەیانوت، ئێوە کەم ترین و سوك و ریسواترینی خەڵکانی سەر دنیا بوون. ئەگەر فەرمانڕەوایی توبەع لەسەر ئێران، لەرۆژگارێکی نزیکدا بووایە، عەرەبەکان بەئێرانییەکانیان دەوت ئێمە دوێنێ

پاشاکەی ئێوەمان کوشت و فەرمانڕەوایەتی وڵاتەکەی ئێوەمان کرد و ڕێزی ئێوەمان خستە ژێر پێ، ژنانی ئێوەمان گرت و پیاوانی ئێوەمان کردە کۆیلە و سامانی ئێوەمان تاڵان کرد. بێدەنگی عەرەبەکان لەو ڕوداوە و بێزاربوونیان لەوتەی ئێرانییەکان (لەبارەی پەستی و نزمی عەرەب) هێماوی دووری ئەو ڕوداوە یا لەسەرتاوە، ڕاست نەبوونیەتی. جیاواز لەوەیش، ئێرانییەکان بەم داستانە ڕازی نابن نە لەمێژووی کۆنی خۆیان و نە لەداهاتوویان. ئەوان دەڵێن: پاشایەتی ئەوان لەسەردەمی کیومەرس کەهەمان ئادەمە، نەڕوخا تا ئیسلام هات. ئەم جگە لەڕۆژگاری کورتی پاشای تیرەکانە. لەم ڕۆژگارەیشدا، ئێرانییەکان فەرمانڕەوایەتی بەشێك لەوڵاتی ئێرانیان دەکرد. جیاواز لەوەیش، نوسەرانی بەسەرهاتەکان، لەبارەی ئەو توبەعەی لەشکری کێشا و سەرزەمینە بەربڵاوەکانی گرت، بەشێوەیەکی سەیر گرفتاری چەند لایەنی لەنووسینەکانیاندا بوون. دەستەیەك دەڵێن ئەو شەمر کوڕی غەش و دەستەیەك دەڵێن توبەع ئەسعەد بوو. ئەو شەمر زوالجەناحی بۆ سەمەرقەند نارد و زۆر لەم ناسازگاریانەیە کە ئاماژەدان پێیان ئەنجامی نییە، بۆ ئاشکرا کردنی کەم و کوڕی و ناراستی ئەوان ئەمە بەسە.

## پاشایەتی لەختیعە

کاتێك عەمرۆ مرد و حەمیریەکان بڵاوەیان لێکرد، پیاوێك لەحەمیر نە لەبنەماڵەی پاشایەتی، بەسەر ئەواندا زاڵ بوو کە پێیان دەوت لەختیعە کوڕی تنوف (ینوف) چەند پەنجەیی (شەش پەنجەیی؟). ئەو بووە پاشای ئەوان. ئەمە وتەی کوڕی ئیسحاقە. ئەو کەسە باش و هەڵبژێردراوەکانی ئەوانی کوشت و گاڵتەی بەبنەماڵەی پاشایەتی کرد. پیاوێکی خراپەکار بوو کەدەستەیەك دەیانوت: کارە ناڕەواکانی نەتەوەی لوت دوبارە دەکاتەوە. کاتێك ناوی یەکێك لەشازادە جوانەکانی دەبیست، کەسی دەنارد بەشوێنیدا و دەیهێنا و لەناو حەوزێکدا جوتی دەبوو تا دوای ئەو سەرشۆڕیی نەتوانێت پاشایەتی بکات. ئەوسا بەدەم شۆڕێك لەدەم، دەهاتە لای پاسەوانان و سوپاکەی خۆی و بەم کارەی نیشانی دەدا کاری ئەو کوڕەی تەواو کردووە (گاویەتی). ئەوسەا بەرەڵا و ریسوای ناو خەڵکی دەکرد.

## پاشایەتی زونواس

یەکێك لەشازادەکان زەرعە زونواس کوڕی تەبان ئەسعەد ئەبو کرب بوو. کاتێك براکەی حسان کوژرا، منداڵێکی کەم تەمەن بوو. ئەو گەشەی کرد وکوڕیکی قیت و قۆز لەناو دەرهات. لەختیعە داوای کرد تا ئەو بەڵایش بەسەر ئەودا بێنێت کەبەسەر ئەوانیتردا هێنای. ئەو کێردێکی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و لەناو قاچ و پێڵاوەکانی خۆی دایشارد. دواتر لەگەڵ نێردراو رۆشتە لای لەختیعە. کاتێك لەحەوزەکە لەگەڵی بەتەنیا مایەوە، ئەوی کوشت و سەری بڕی و لەسەر پەنجێرەی حەوزەکە داینا و دەمشۆرەکەی خستەدەمی و دواتر هاتەدەر. پێیان وت: ئەی زونواس تەری یا وشك؟ وتی: لەم سەرە بپرسن. زونواس لەهیچ ناترسێت.

بینیان لەختیعەی سەربڕیوە. حەمیریان و پاسەوانانی پاشا بەدوایدا گەران و دۆزیانەوە و کردیانە پاشای خۆیان چوونکە ئەوانی لەبەڵای لەختیعە رزگار کرد.

ئەوان دەوریان گرت. ئەو لەسەر ئایینی یەهودی بوو. لەنەجران پاشماوەکان لەشوێنکەوتوانی عیسا کوڕی مریەم ژیانیان بەسەر دەبرد کەدینەکەی خۆیان دەپاراست. ئەوان سەرۆکێکیان بوو کەپێیان دەوت عەبدوللە کوڕی سامر. ئەو ئەم ئایینەی لەنەجراندا بڵاو کردبوویەوە.

وەهب کوڕی مونبە دەڵێت: پیاوێك لەپاشماوەکانی دینی عیسا بوو پێیان دەوت فیمیون (ڤیمیون). پیاوێکی چاکەکار و خۆپارێز بوو، خوا وەڵامی داواکارییەکانی دەدایەوە. بەدنیادا دەگەڕا و لەهەر ئاوەدانییەك دەیانناسی، کۆتایی بەمانەوەی دەهێنا و دەڕۆشت و لەشوێنێکیتر نیشتەجێ دەبوو. جگە لەدەسترەنجی خۆی نانی نەدەخوارد. قورەکاری دەکرد و رێزی لەرۆژی یەك شەممە دەگرت و کاری نەدەکرد و دەڕۆشتە دەشت و بیابان و سەراسەری رۆژ بۆ نوێژ دەوەستا. لەیەکێك لەئاوەدانییەکانی شام مایەوە و بەنهێنی کرێکاری و خواپەرستی دەکرد. پیاوێك بەناویساڵح لەنهێنی ئەو ئاگادار بوویەوە. فیمیون بۆ هەر شوێنێك دەڕۆشت، بەدوایدا دەڕۆشت و فیمیون نەیدەزانی. ساڵح بەنهێنی لەشوێنێك دادەنیشت بەشێوەیەك فیمیونی دەبینی بەڵام ئەونا. فیمیون بۆ نوێژ وەستا، لەمکاتەدا ئەژدیهایەك روی تێکرد. کاتێك فیمیون بینی، لەخوا پاڕایەوە و ئەژدیهاکە دەستبەجێ مرد. ساڵح ئەژدیهای بینی بەڵام نەیزانی چی بەسەر هاتووە. ڤیژاندی ئەی فیمیون، ئەژدیها روی تێکردوویت. ئەو سەیری ساڵحی نەکرد و سەرقاڵی نوێژ کردن و پاڕانەوی خۆی بوو تا ئەوەی شەو داهات. زانی ساڵح ئەوی ناسیوە. ساڵح گفتوگۆی لەگەڵدا کرد و پێی وت: خوا دەزانێت تا ئێستا کەسم ئەوەندە خۆش نەویستووە. ئێستا دەمەوێت بۆ هەر شوێنێك دەڕۆیت لەگەڵ تۆدابم. فیمیون وتی: ببە. ساڵح بووە هاورێی. کاتێك بەندەیەك لەبەندەکانی خوا زیانی پێدەگەشت، ئەگەر فیمیون دەڕۆشتە لای، لەخوا بۆی دەپارایەوە و ئەو بەندەیە چاك دەبوویەوە. بەڵام ئەگەر بۆ لای نەخۆشێك بانگیان دکرد، نەدەڕۆشت. یەکێك لەدانیشتوانی ئاوەدانی، کوڕیکی کوێری بوو. پیاو ئەوی بردەماڵێك و داپۆشی و بەفیمیونی وت دەمەوێت بێیتە ماڵەکەی من کاربکەیت. وەرە ماڵ تا کار و کرێکەی بەتۆ بڵێم. فیمیون لەگەڵی رۆشت. کاتێك رۆشتە ناو ماڵەکە پیاو کورەکەی نیشاندا و داوای

لەفیمیون کرد لەخوا بۆی بپاڕێتەوە. فیمیون لە خواپارایەوە و کورەکە بینای خۆی بەدەست هێنایەوە.

فیمیون زانی لەو ئاوەدانییەدا ناسراوە. لەگەڵ سالح هاتەدەر. ئەو دووانە لای دارێکی گەورە لەشام تێپەرین. پیاوێك بانگی کرد: هەمیشە چاوەڕێی هاتنی تۆ بووین. لێرە بمێنەرەوە و مەڕۆ. وەرە سەرسەرم کەئێستا دەمرم. دەڵێت: ئەو مرد و فیمیون بە خاکی سپارد و لەگەڵ ساڵحدا رۆشت. ئەو دووانە رۆشتن تا گەشتنە یەکێك لەسەرزەمینەکانی عەرەب. دەستەیەك لەعەرەبەکان ئەوانین گرت و لەنەجران فرۆشتیان. خەڵکی نەجران لەسەر دینی عەرەبەکان بوون و دار خورمایەکی گەورەیان دەپەرەست کەلەناو شارەکەدا بوو. ساڵانە لەژێر ئەو دارەدا جەژنیان دەگرت و لەرۆژی جەژن بەجوانترین شێوە ئەو دارەیان دەرازاندەوە. رۆژێك چراغانیان کرد. لەم کاتەدا یەکێك لەگەورەکانی ئەوان فیمیونی کڕی و یەکیتر ساڵح. کاتێك شەو دادەهات فیمیون لەماڵەوە بۆ نوێژ رادەوەستا و ماڵ تا بەیانی بێ چرا بۆ ئەو روناك دەبوویەوە. کاتێك گەورەکەی ئەمەی بینی، سەریسورما و لەدینەکەی پرسی و فیمیون دینەکەی خۆی وت و سەرکۆنەی دینی گەورەکەی کرد و پێی وت: ئەگەر داوا لەو خوایە بکەم کەدەیپەرەستم، ئەو دار خورمایە لەناو دەبات. گەورەی وتی: ئەگەر ئەم کارە بکەیت دێینە سەردینەکەی تۆ و واز لەدینەکەی خۆمان دێنین. فیمیون بۆ نوێژ وەستا و لەخوا پارایەوە. خوا بایەکی بۆ ئەو دار خورمایە نارد، وشکی کرد و ڕزاندی. دوای ئەم روداوە، خەڵکی نەجران هاتنە سەر دینەکەی ئەو و ئەوانی خستە سەر ئایینی مەسیحی و کاروباری ئەوانی لەسەر بنەمای ئایین رێکخست. دوای ئەوە، چەندین روداو لەدینەکەی ئەوان هاتە ئاراوە و ئەوانی بەرەو گومرایی و تاریکی برد. لێرەوە ئایینی مەسیحی لەنەجران دەرکەوت.

محەممەد کوڕی کەعبی قۆرەزی دەڵێت: خەڵکی نەجران بتپەرەست بوون. لەیەکێك لەدێهاتەکانیان جادوگەرێك دەژیا کە نەجرانییەکان منداڵەکانی خۆیان بۆ فێربوونی جادوو دەناردە لای ئەو. کاتێك فیمیون گەشتە ئەویێ( ئەو پیاوێك بوو لەسەر رێنماییەکانی عیسا خوای دەپەرستی)، هەرجار لەشوێنێك دەناسرایەوە، لێی

دەرۆشتەدەر و لەشوێنێکیتر دەمایەوە. خوا وەڵامی داواکارییەکانی دەدایەوە و ئەو بەخواستی خوا نەخۆشەکانی چاك دەکردەوە. ئەو چەندین نمایشی لەهێزی ئاسمانی پێبڕا بوو. هاتە نەجران و لەخێوەتێك لەنێوان ئەم شارە و شاری جادووگەر مایەوە. سامر کورەکەی عەبدوڵلە لەگەڵ کورەکانی ناردە لای جادوگەر. ئەو لای فیمیون تێپەری و لەنوێژەکەی ئەو سەریسورما. لای ئەو دانیشت و گوێی لەقسەکانی گرت. هاتە سەر ئایینەکی فیمیون و خوای تاق و تەنیای وەسف دەکرد. بەردەوام گەورەترین ناوی خوای لەفیمیون دەپرسی (فیمیون دەیزانی) بەڵام پێی نەدەوت و دەیفەرموو توانای بەرگە گرتنی ئەوت نییە. سامر گومانی دەکرد کورەکەی لەگەڵ کورەکانیتر بۆ لای جادوگەر دێت و دەروات. کاتێك عەبدوڵلە بینی فیمیون گەورەترین ناوی خوایی لێ دریغ دەکات، چەند دارێکی هەڵگرت و هەموو ناوەکانی خوای لەسەر نوسی و یەك یەك خستیە ناو ئاگرەوە، کاتێك دارێك کەگەورەترین ناوی خوای لەسەر نابوو، خستە ناو ئاگر، لێی هاتەدەر و ئاگر زیانی پێ نەگەیاند. ئەوی هەڵگرت و هێنایی و بەسەرهاتەکەی بۆ گێرایەوە. پیاو وتی: لای خۆت بیپارێزە چوونکە ئیتر گومانم نەماوە. عەبدوڵلە بوو بەعەبدوڵلەیەك کەهەر نەخۆش و گرفتارێکی لەنەجران دەبینی، دەیوت: ئەی بەندەی خوا، ئایا دێیتە سەردینەکی من تا لەخوا بپارێمەوە لەم نەخۆشی و بەڵایە رزگارت بێت؟ دەیوت: بەڵێ. ئەو دەبووە خواپەرەست و خوای تاق و تەنیای دەپەرەست. عەبدوڵلە لەخوا دەپارایەوە و خوا چاکی دەکردەوە یا لەگرفتاری رزگاری دەکرد. هیچ کام لەنەخۆش و گرفتارەکانی نەجران نەمانەوە مەگەر ئەوەی هاتە لای عەبدوڵلە و باوەری هێنا و ئەو لەخوا بۆیان پارایەوە و ئەو نەخۆش یا گرفتارە رزگاری بوو.

ئەم هەواڵەیان بەپاشای نەجران گەیاند. عەبدوڵلەی بانگ کرد وپێی وت: لەگەڵ ئایینەکەی من ناسازگاریت دەست پێکردووە و خەڵکی شارەکەی منت دژی من راپەراندووە. تیکە تیکەت دەکەم. وتی: ناتوانیت. ئەویان دەبردە سەر لوتکەی کێوێکی زۆر بەرز و فڕیان دەدایە خوار و ئەو لەسەر قاچ دەهاتە خوار و زیانی پێنەدەگەشت. کاتێك عەبدوڵلە بەسەریدا زاڵبوو، پێی وت: تۆ ناتوانیت من بکوژیت مەگەر ئەوەی باوەر بەخوا بێنیت و ئەو بپەرەستی بەهەمان شێوە من. ئەگەر ئەم

کاره بکەیت دەتوانیت من بکوژیت. پاشا خواپەرەستی کرده پیشه و دواتر بەداردەستەکەی دەستی لێدانێکی هێواشی لێدا و ئەوی کوشت و دواتر پاشا لەجیاتی ئەو لەناوچوو و هەموو خەلکی نەجران لەسەر دینی عەبدوللە سامر مانەوە.

دەڵێت: ئەوسا زونواس هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی روی کرده ئەوان و بۆ باوەڕ هێنان بەئایینی جولەکە هانیدان و لەنێوان باوەڕهێنان و کوژران سەرپشکی کردن. ئەوان کوژرانیان هەڵبژارد. چاڵێکی بۆ هەڵکەندن و ئەوانی کرده ناو ئاگرەوە. بە شمشێریش لێی کوشتن بەشێوەیەك ژمارەی سوتاو و کوژراوەکان گەشتە بیست هەزار کەس.

عەبدوللە کوڕی عەباس دەڵێت: لەنەجران یەکێك لەپاشاکانی یەمەن بەناوی زونواس فەرمانرەوایەتی دەکرد و ناوی شورەحبیل بوو. ئەو حەفتا ساڵ پێش لەلەدایك بوونی پێغەمبەر دەژیا و جادوگەرێکی شارەزا بوو. کاتێك ژیانی درێژەی کێشا، بەپاشای وت: من پیر بووم، کوڕیك بۆ لای من بنێره تا جادووی فێر بکەم. ئەو گەنجێکی بەناوی عەبداله کوڕی سامری نارده لای. ئەو هاتوچۆی جادوگەری دەکرد. لەسەر رێگای خواپەرەستێکی دەنگ خۆش دەژیا کاتێك بەرەو ماڵی مامۆستاکەی دەرۆشت، لای ئەو پیاوە گوزەری دەکرد و لای دادەنیشت. کاتێك دەگەشتە لای مامۆستاکەی، لێیدەدا و دیوت: بۆ درەنگ هاتوویت؟ و کاتێك بۆ لای باوك دەگەرایەوە ، باوك لێیدەدا و دەیوت: بۆ درەنگ گەراویتەوە؟ کور گلەیی برده لای ئەو پیاوە. وتی: کاتێك دەرۆیتە لای مامۆستا بڵێ باوکم درەنگی خستم و کاتێك دەرۆیتە لای باوك بڵێ مامۆستاکەم درەنگی خستم. لەو شارەدا ئەژدیهایەکی گەورە رێگەی لەخەڵك گرتبوو. کورەکە بە بەرد کوشتی و هاتە لای ئەو پیاوە و بۆی گێرایەوە. وتی: تۆ چارەنووسێکی دژوار چاوەرێتە. تۆ ب زویی گیرۆدە تاقی کردنەوە دەبیت، و هەرکات ئەمە رویدا ئاگداربە کەس بۆ لای من نەنێریت. کور کوێری سکوما و گولی چاك دەکردەوە و نەخۆشەکانی شیفا دەبەخشی. پاشا کوره مامێکی کوێری بوو، کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەژدیهای بەدەستی کورەکە بیست، پێی وت: لەخوا بۆمن بپارێرەوە تا کوێریم چاك بکاتەوە. کوڕ وتی: ئەگەر خوا بینایت بۆ بگەرێنێتەوە، باوەری پێ دێنیت؟ وتی: ئەرێ. کور وتی: خوایە ئەگەر راست دەکات

بینایی بۆ بگەڕێنەرەوە. بینایی ئەو گەرایەوە. کورە مام هات لای پاشا و کاتێك ئەوی بینی سەریسورما و پرسی چی بووە. ئەو هیچی نەوت. پاشا پێداگری کرد و ئەو ناوی کوڕەکەی برد. ئەویان هێنا و پاشای پێی وت: جادوگەری تۆ گەشتۆتە ئەم ئاستە کەدەیبینم. کور وتی: من کەس چاك ناکەمەوە، ئەوە خوایە ئەو کارەدەکات و هەر کەسی بووێت چاکی دەکاتەوە. پاشا ئەوەندە ئەشکەنجەی کرد تا ناوی پیاوەکەی درکاند. پاشا فەرمانیدا ئەو پیاوەیان هێنا وپێی وت: لەدینەکەی خۆت پەشیمان ببەرەوە. ئەو نەیکرد. فەرمانیدا و مشاریان هێنا و خستیانە سەری و لەناوەڕاستەوە کردیان بە دوکەرت. دواتر کورە مامی پاشایان هێنا و وتیان لەدینەکەی خۆت پەشیمان ببەرەوە و ئەو نەگەرایەوە و بووە بەدوو کەرت. بەکورەکەی وت: لەدینەکەت پاشگەز ببەرەوە. ئەو رازی نەبوو. پاشا ئەوی بردە سەر کێوێکی بەرز وخستیە خوار و کور وتی: خوایە، زیانی ئەوان لەمن دوور کەرەوە. کێو ئەوانی لەرزاند و هەموویانی لەناو برد. کور بۆ لای پاشا گەرایەوە و ئەو لەپیاوەکانی پرسی و وتی: خوا زیانی ئەوانی لەمن دوور کردەوە. پاشا تورە بوو و ئەوی بەکەشتی ناردە ناوەراستی دەریا تا بیخەنە ناو ئاو و لەناو بچێت. ئەوان بردیان. وتی: خوایە زیانی ئەوان لەمن دوور بکەرەوە. ئەوان لەئاودا خنکان و ئەو رزگاری بوو و گەرایەوە بۆ لای پاشا. وتی: بە شمشێر بیکوژن. شمشێریان لێدا بەڵام کاریگەری لەسەر ئەو بەجێ نەهێشت و کول بوو. ئەم بەسەرهاتە لە یەمەندا بڵاوبوویەوە و خەڵك ئەویان بەگەورە زانی و زانیان راستی و دروستی لەگەڵدایە. کور بەپاشای وت: تۆ ناتوانی من بکوژیت مەگەر ئەوەی هەموو خەڵکی وڵاتەکەت کۆبکەیتەوە و لەبەرچاوی هەموویاندا تیرێك لەمن بدەیت و بڵێیت: بەناوی خوا کەخواوەندی ئەم کوڕەیە. پاشا ئەم کارەی کرد و کورەکەی کوشت.

خەڵك وتیان: باوەرمان بەخوای کورەکە هێنا. بەپاشا وترا: ئەوەی لێی دەترسایت، روبەروت بوویەوە. ئەو دەروازەکانی شاری بەست و چاڵێکی هەڵکەند و ئاگری رۆشن کرد و خەڵکی یەك یەك لێ تێپەراند. هەرکەس لەدینەکەی خۆی گەرایەوە، رزگاری بوو و هەر کەس نەگەرایەوە، کەوتە چاڵەکە و سوتا.

لەوێ ژنێکی خواپەرەست دەژیا، سێ کوڕی بوو و یەك لەوان هێشتا شیری دەخوارد. پاشا بەژنەکەی وت: لەدینەکەت پەشیمان ببەرەوە و گەرنە تۆ لەگەڵ منالەکانت دەکوژم. سەرەتا دوو کورە گەورەکەی خستە ناو ئاگر و ژن رازی نەبوو. دواتر کورە شیرخۆرەکەی هەلگرت تا بیخاتە ناو چاڵی ئاگر و ژن مەبەستی پەشیمان بوونەوەی کرد. منالّەکە وتی: دایە، لەدینەکەت پەشیمان مەبەرەوە چوونکە هیچ ترسێك لەسەر تۆنییە. پاشا ئەوی خستە ناو چاڵی ئاگر و دایکی بەدوایدا. ئەمە یەکێگ لەو مندالانە بوو لە تەمەنی منالّیدا قسەی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: پیاوێك لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب وێرانەیەك دەگەرا و عەبدوللە کوڕی سامری بینی کەدەستی لەسەر قەڵشتی سەریەتی. ئەگەر دەستیان هەڵدەگرت خوێن دەهاتە خوار و ئەگەر دەستیان هەڵنەدەگرت، وەك خۆی لێدەهاتەوە. ئەو لەشوێنەکەی خۆی دانیشتبوو. بۆ عومەریان نوسی و ئەو فەرموی کاریان پێی نەبێت.

## فەرمانرەوایی حەبەشیەکان لەسەر یەمەن

دەڵێن: کاتێك زونواس ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکانی یەمەن بۆ گەرانەوە لەئایینی مەسیحی خستە ناو ئاگرەوە، پیاوێك لەناویاندا رزگاری بوو کەپێیان دەوت ((دوس زوسەعبان)). ئەو، ئەوانی بێزار کرد و تەنگی پێهەڵچنین. ئەو هاتە لای سزار و لەبەرابەر زونواس داوای هاوکاری لێکرد و بەسەرهاتی خەڵکی یەمەنی بۆ گێرایەوە. سزار وتی: ولاتی تۆ لەئێمەوە دوورە. بەلام بۆ پاشای حەبەشە دەنوسم کە لەئێوە نزیکە و لەسەر ئەم دینەیە. سزار نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا هاوکاری پیاوی یەمەنی بکات. پاشای حەبەشە سوپایەکی کۆکردەوە کەلەخۆگری حەفتا هەزار پیاوی شەرکەر بوو و لەگەڵ ئەو پیاوەدا ناردی و فەرماندەیی سپردە کەسێك بەناوی ئەیات(ئەربات). لەناو سوپاکەی ئەو ئەبرەهە ئەشرەم دەبینرا. لەدەریاوە بەرێکەوتن تا گەشتنە قەراغەکانی یەمەن. زونواس لەشکری خۆی کۆکردەوە بەلام شەڕ روینەدا جگە لەوەی ئەو هەوڵیدا و لەشکرەکەی شکستی خوارد و ئەریات هاتە ناو یەمەن. کاتێك زونواس بینی چی بەسەرهاتووە، بەئەسپەکەی خۆی لەدەریایی دا

و خنکا. ئەریات سەرزەمینی یەمەنی داگیر کرد و یەك لەسەر سێی پیاوەکانی کوشت. ئەو یەك لەسەر سێی دیلەکانی نارده لای نەجاشی و دواتر لەوێ مایەوە و خەڵکی یەمەنی سووك کرد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك حەبەشیەکان گەشتنە مەندەب لەولاتی یەمەن، زونواس نامەی بۆ گەورەکانی وڵات نوسی و داوای لێکردن بۆ روبەروبوونەوەی دوژمن کۆببنەوە. ئەوان وەڵامیان نەدایەوە و وتیان: هەرکەس لەولاتی خۆی بەرگری بکات و شەڕی بۆ بکات. ئەو کلیلەکانی دروست کرد و باری چەند وشتری کرد و رۆشتە بینینی حەبەشیەکان و پێیانی وت: ئەمانە کلیلی خەزێنەکانی یەمەنە، هەڵیانگرن و پیاوان مەکوژن و منالٚ و ژنان ئازار مەدەن. ئەوان بوونە هاوەڵی و پێکەوە هاتنە سەنعا. ئەو بەسەرکردەی ئەوانی وت: سوپاکەت بۆ گرتنی دارایی و سامان بنێرە. هاوەڵانی بلاوەیان لێکرد و ئەو کلیلەکانی پێدان و بۆ گەورەکانی یەمەنی نوسی: هەر گایەکی رەشتان بینی بیکوژن. بەمشێوە هەموو حەبەشیەان کوژران و جگە لەچەند کەسی هەڵاتوو کەس رزگاری نەبوو. کاتێك ئەمە بەگوێی نەجاشی گەشت، حەفتا هەزار پیاوی شەڕکەری نارده شەڕی یەمەنییەکان و فەرماندەیی سپاردە ئەریات و ئەشرەم. ئەریات چەند ساڵ لەوێ مایەوە و ئەبرەهە ئەشرەم لەسەر فەرمانرەوایەتی دژایەتی کرد. ئەو لەسوپای ئەریاتدا بوو. دەستەیەك شوێن ئەریات کەوتن و هەندێ شوێن ئەشرەم. ئەو دووانە شەڕی یەکیان کرد. ئەبرەهە پەیامی دا: رەوا نییە حەبەشیەکان بخەیتە گیانی یەك تا لەناویان بەریت. تەنیا لەگەڵ من شەڕ بکە، هەر کەس سەرکەوت فەرماندەیی بەو بێت.

ئەو دووانە روبەروی یەك بوونەوە و شەڕیان کرد. ئەریات ئامرازی شەری هەلگرت و لەسەری ئەبرەهەی دا، سەری شکا و لوتی بڕا و لەبەر ئەوە پێی دەڵێن ئەشرەم (لوت بڕاو). کۆیلەیەکی ئەبرەهە کە لەپشتی سەریانەوە کەمینی گرتبوو، هاتەدەر و ئەریاتی کوشت. ئەبرەهە بەسەر ئەرتەش و ولاتدا زاڵ و بەعتودەی وت: داوای پاداشت لەمن بکە. وتی: هیچ بووکێك لەیەمەن نەرواتە باوەشی تینوی پیاوەکەی، مەگەر ئەوەی سەرەتا لەباوەشی من ئارام بگرێت. ئەبرەهە وتی: بەمشێوە

دەبێت. ئەو رۆژگارێك ئەم كارەی لەگەڵ خەڵكی یەمەن كرد تا ئەوەی پیاوێك لە یەمەن بەسەریدا زاڵ و خوێنی رشت. ئەبرەهە شادمان بوو و وتی: ئەگەر دەمزانی داوای ئاوا شتێكم لێدەكات، لەهەڵبژاردنی پاداشت سەرپشكم نەدەكرد.

كاتێك بەسەرهاتی كوشتنی ئەریات بەگوێی نەجاشی گەشت، تووڕەبوو. سوێندی خوارد دەست لەئەبرەهە هەڵنەگرێت تا لەبەردەم ئەودا كورنوش بەرێت و ئەو موی ناوچاوانی ببڕێت. كاتێك ئەبرەهە ئەمەی بیست، مشتێك لەخۆڵی یەمەنی هەڵگرت و سەری لێسو و موی ناوچاوی خۆی بڕی و هەمووی بۆ نەجاشی نارد و نامەیەكی نووسی كەگوێڕایەڵی ئەوی نیشان دەدا و داوای لێكرد پێ بخاتە سەر ئەو مو و خۆڵە تا سوێندەكەی بەجێبهێنابێت. نەجاشی شادمان و ئەوی لەسەر فەرمانڕەوایی هێشتەوە.

كاتێك ئەبرەهە لەیەمەن جێگیر بوو، پەیك و پەیامی بۆ باوكی مورە زی یەزن نارد و ژنی ئەو رێحانە كچی زی جەدنی خوازبێنی كرد و ئەوی وەك هاوسەری هەڵبژارد. ئەم ژنە مەسروقی بۆ هێنایە دنیا وپێشتر بۆ باوكی مورە زی یەزن منالێكی بەناوی مەعدی كەرب هێنابووە دنیا كەهەمان سەیف زی یەزنە. باوكی مورە زی یەزن لەیەمەن رۆشتەدەر و لەحیرە لای عەمرۆ كوڕی هند نیشتەجێ بوو و داوای لێكرد بۆ خوسرەو شای شاكانی ئێران نامە بنوسێت و پێگەو و گەورەیی پێویست بەو ببەخشێت. عەمرۆ كوڕی هند وتی: من ساڵانە دەرۆمە لای خوسرەو و ئێستا كاتیەتی. باوكی مورە زی یەزن لای عەمرۆ مایەوە و لەگەڵ ئەو رۆشتە لای خوسرەو. خوسرەو بەگەورەی زانی و رێزی لێگرت و باوكی مورە لای ئەو پارایەوە و نیازەكەی خۆی وت و ئەو بەڵای گێرایەوە كەبەسەرحەبەشیەكانی یەمەن هاتبوو. داوای هاوكاری لێكرد. هەروەها تەماحی خستە بەردەم بۆ گرتنی خاكی یەمەن و سامانە فراوانەكەی. خوسرەو ئەوشیروانی دادپەروەر پێی وت: ئارەزومە هاوكاری تۆ بكەمنو نیازەكەت بێنمە دی بەڵام رێگاكانی گەشتن بەوڵاتەكەی تۆ دژوارن. با بیربكەمەوە. خوسرەو فەرمانیدا شوێنی نیشتەجێ بوونی بۆ ئامادە بكەن. رێزیان لێگرت وباوكی مورە بۆ ماوەیەك لای ئەو مایەوە و سەرئەنجام كۆچی دوایی كرد.

لەولا كورەكەی مەعدی كەرب كوڕی زی یەزن لە داوێنی ئەبرەهە گەورە بوو و

گومانی کرد باوکی خۆیەتی. رۆژێك یەکێك لەکورەکانی ئەبرەهە جنێوی بەخۆی و باوکی دا (مەعدی کەرب زانی جگە لەئەبرەهە باوکێکی دیکەی هەیە). ئەو سەبارەت بەباوکی لەدایکی پرسیاری کرد و دایك راستی پێوت. ئەو مایەوە تا ئەبرەهە و کورەکەی یەکسوم مردن. ئەوسا لەیەمەن هاتەدەر و ئەوەی کرد کەبەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

## پاشایەتی خوسرەو ئەنەوشیروان کوڕی قوباد

کوڕی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی بەهرامی گور کوڕی یەزدگێردی گوناحکار

کاتێك تاجی خستەسەر، وتارێکی پێشکەش بەخەڵك کرد. دواتر لەخوا پارایەوە و بەپاکی ناوی برد. دواتر بەئازارەکانی خەڵك راگەشت و ئەوەی گرفتاری ببوون (وەك بەفیرۆچونی کارەکانیان و دین و منداڵەکانیان) دیاری کرد و مژدەی دا هەموویان راست دەکاتەوە. فەرمانیدا و رێبەرە مەزدەکیەکان کوژران و سامانی ئەوان لەناو نەداراندا دابەش کرا.

هۆکاری کوشتنی ئەوان ئەوە بوو قوباد (وەك ئاماژەمان پێدا) بووە شوێنکەوتوی ئاینی مەزدەك و هەموو فەرمانەکانی مەزدەکی جێبەجێ کرد(وەك بێ دینی و کارە هاوشێوەکان کە لەباسی پاشایەتی قوباد ئاماژەمان پێدا). لەم زەمانەدا مونزەر کوڕی ما السما فەرمانرەوایی حیرە و سنورەکانی لەئێران بوو. قوباد داوای لێکرد بروا بەئایینی مەزدەکی بێنێت بەڵام مونزەر رازی نەبوو. ئەو داوای لەحارس کوڕی عەمرۆ کێندی کرد و مونزەری لەوڵاتەکەی دەرپەراند. رۆژێك دایکی ئەنەوشیروان لای قوباد بوو. مەزدەك هاتە لای و کاتێك دایکی ئەنەوشیروانی بینی، بە قوبادی وت: ژنەکەت بە من بدە تا چێژی لێوەربگرم. قوباد وتی: ژنەکەم بۆ خۆت هەڵبگرە. ئەنەوشیروان لەشوێنەکەی هەستا، گریا و پاڕایەوە تا مەزدەك دەست لەدایکی هەڵگرێت. تەنانەت قاچی مەزدەکی ماچ کرد. مەزدەك دەستی لێهەڵگرت. ئەم کارە کاریگەری نگەتیفی لەسەر ئەنەوشیروان بەجێهێشت.

قوباد لەسەر ئایینی مەزدەکی مرد و ئەنەوشیروان بەپاشایەتی گەشت. کاتێك

مونزەر لەمردنی قوباد ئاگادار بوویەوە، روی کردە بارەگای ئەنەوشیروان. ئەو دەیزانی ئەنەوشیروان لەسەر دین و لایەنگری باوکی لەمەزدەك لەگەڵ ئەو ناسازگارە. ئەنەوشیروان لەسەرەتاوە حاشاکەر و دوژمنی ئەم دینەبوو. ئەوسا ئەنەوشیروان میوانییەکەی گشتی رێکخست و مەزدەك هاتە لای و مونزەریش. ئەنەوشیروان وتی: من دو ئارەزوم هەبوو کەهیوادارم خوای گەورە هەر دووکیانی بۆ بەدی هێنابێتم. مەزدەك پرسی: شای شاکان، کام ئارەزووانە؟ ئەنەوشیروان وتی: ئارەزووم بوو ئەم پیاوە بەرێزە بەپاشایەتی بگەیەنم و ئەم بێ دینانە بکوژم. مەزدەك پرسی: ئایا دەتوانی هەموو خەڵك بکوژیت؟ ئەنەوشیروان وتی: ئەی روسپی زادە! سوێند بەخوا لەو رۆژەوەی قاچی تۆم ماچ کرد تا ئەمرۆ بۆنی بۆگەنی گۆرەوییەکانت لەلوتم دوور نەکەوتۆتەوە. فەرمانیدا و لەداریان دا و کوشتیان. لە یەکرۆژدا سەد هەزار کەسی لەمەزدەکیەکان لە گازر تا نەهرەوان و مەداین کوشت و لەداری دان. لەو رۆژەوە بەئەنەوشیروانی دادپەروەر ناوبرا.

ئەنەوشیروان بەدوای حارس کوڕی عەمرۆ گەرا. ئەم هەواڵە لەئەنبار بەو گەیشت. ئەو لەگەڵ هاورێ و کەس و سامانەکانی خۆی هاتەدەر و هەڵات. لەسەر رێگەی خۆی لەسەویە تێپەری و مونزەر لەگەڵ سوارەکانی تەغلەب و ئەیاد و بەهرا شوێنی کەوت. روی کردە سەرزەمینیە کەلب و رزگاری بوو و ئەمان دەستیان بەسەر سامان و زێر و چوارپێکانی گرت. مناڵەکانی تەغلەب چل و هەشت کەسیان لەمناڵەکانی ئاکێل المورار گرت و هێنایانە لای مونزەر. موزنەر لەشوێنێك بەناوی (حفر المال) لەسەرزەمینی مناڵەکانی مەرینی عیبادی، لەنێوان ئاوەدانی مناڵەکانی هند و کوفە لەسێدارەیدان. ئەوەی عەمرۆ کوڕی کلسوم وتویەتی ئاماژەیەکە بەم داستانە:

فابووا بالنهاب و بالسبایا        و اکوریاء الملوکط مصفدینا

واتاکەی: تاڵانی و دیلەکانیان هێنایەوە و هاورێ لەگەڵ ئەوان شازادەکانیان هێنا کە هەموویان زنجیر کرابوون.

ئەمرۆ القیس لەبارەی ئەوان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ملوك من كوريى حجر كوري عمرو | يساقون العيشة يقتلونا |
| فلو فى يوم معركة اصيبووا | و لكن في ديار كوريى مرينا |
| ولم تغسل جما جمهم بغسل | و لكن فى الدماء مرملينا |
| تظل الطير عاكفة عليهم | و تنتزع الحواجب و العيونا |

واتاکەی: پاشایانێك لەمناڵەکانی حەجر کوڕی عەمرۆ بوون. ئەوانیان دەکێشا تا دەمەو ئێوارێ لەداریان بدەن. خۆزگە لەگۆرەپانی شەڕ لەخاك و خوێندا گەوزابوون. بەڵام بەداخەوە لەسەرزەمینی مناڵەکانی مەرین کوژران. سەریان نەشۆر بەڵکو لەخوێندا سوور بوو. باڵندەکان لەبەیانی تا ئێوارێ لەسەر جەستەکانی ئەوان هەڵدەفرین و برۆ و چاوەکانیان دەرهێنان.

کاتێك ئەنەوشیروان مەزدەك و هاوەڵانی کوشتار کرد، فەرمانیدا ئەو دەستە لەمەزدەکیان کەدەستیان بەسەر سامانەکانی خەڵکدا گرتبوو، بکوژن و سامانەکان بۆ خاوەنەکانیان بگێرنەوە و هەر مناڵێك کە لەسەر باوکی دژایەتی هەیە و باوکی ناناسن، بەو کەسانە بدەن کەلەوانە و بەشێك لەسامانی ئەو پیاوە (ئەگەر پێی رازی دەبێت) بەو ببەخشن و هەر ژنێك کەبەزۆر براوەتە ماڵی کەسێك، لەو زۆردارە مارە بکەن و دواتر ژنەکە سەرپشك بکەن لەوەی لای دەمێنێتەوە یا جیا دەبێتەوە مەگەر ئەوەی مێردێکی بێت و بۆ ئەوی بگەڕێننەوە.

دوبارە فەرمانیدا ژنان و کچی گەورەکان کەسەرپەرستەکانیان مردون، بکەنە هاوسەری هاوتای مێردەکانیان و لەخەزێنە مارەیی ئەوان بدەن. ئەو لەمناڵەکانی ئەوان بۆ مەبەستەکانی خۆی کەڵکی وەرگرت و پردەکانی سەر لەنوێ دروست کردەوە و وێرانییەکانی ئاوەدان کردەوە. ئەسوارانی بانگ کردەوە و زێری بەخشی وکرێیدا و لەسەر ڕێگاکان کۆشك و قەڵاکانی دروست کرد و فەرمانداران و کاربەدەستانی هەڵبژارد و شێوازی ئەردەشێری گرتەبەر. ئەو سەرزەمینانەی بەزۆر لەئێران سەندرابوون، دووبارە دەستی بەسەردا گرتنەوە. لەناو ئەم سەرزەمینانە، دەتوانین ناوی ئەمانە ببەین: سند، سندوست، رەخج، زابولستان و تەخارستان.

ژمارێکی زۆری لەنازوریان کوشت و ئەوانی لەوڵات دەکرد.

لەم کاتەدا ئەبخازیان و بەنجریان و بەلەنجەریان و ئالانەکان مەبەستی سەرزەمینی ئێرانیان کرد و هێرشیان کردە سەر ئەرمەنستان تا خەڵکەکەی تاڵان بکەن. ڕێگاکەیان تەخت و ئاسان بوو. خوسرەو ئەنەوشیروان ڕێگەی پێدان تا لە قوڵایی وڵاتدا ڕۆچون و دواتر لەشکری خۆی کردە سەریان، ڕووبەڕوویان بوونەوە و شکستیان پێهێنان، ژمارەیەکی زۆریان کوشت جگە لەدە هزار کەس کە دیل کران و لەئازەربایەجان نیشتەجێ کران.

خوسرەو ئەنەوشیروان منالێکی بوو کە بەگەورەترین منالی هەژمار دەکرا و ناوی ئەنوشزاد بوو. پێیان وت کورەکەی بێ دینە. ئەنەوشیروان ئەوی بۆ جوندیشاپور نارد و ژمارەیەك لەهاوەڵانی خۆی کە باوەری بەدینەکەیان بوو، کردە هاوەڵی تا بۆ دینی ڕاستی بگەڕێننەوە. لەو کاتەی ئەوان لای ئەم بوون، پێیان وت باوکی ڕۆشتۆتە سەرزەمینی ڕۆم و نەخۆش کەوتووە. ئەو هێرشی کردە سەریان و ئەوانی کوشت و زیندانییەکانی ڕزگار کرد و داوای هاوکاری لێکردن و سوپایەکی لەدز وجەردەکان کۆکردەوە. نوێنەری باوکی لەمەداین لەشکرێکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیان کۆکردەوە و لەجوندیشاپور گەمارۆیان خستەسەر. ئەم بەسەرهاتەیان بۆ ئەنەوشیروان نوسی. ئەنەوشیروان بۆ نوێنەرەکەی نوسی و فەرمانیدا هەوڵی زیاتر بدات و کورەکەی بەدیلی بگرێت. ئەو ئاڵقەی گەمارۆکەی تەنگتر کرد و بەزۆری شمشێر ڕۆشتنە ناو شار و ژمارەیەکی زۆریان لەخەڵك کوشت و ئەنوشزادیان بەدیلی گرت. لەم کاتەدا هەواڵیان بۆ ئەنەوشیروان هێنا کەباوەگەورێی دایکی داوەری ڕازی لەفەرمانداری سیستان یاخی و شەڕی لەگەڵدا کردووە و فەرمانداری سیستانی کوشتوە. دواتر پەنای بردۆتە بەر شاری ڕەخج و تیایدا حەشاری گرتووە. نامەیەکی بۆ خوسرەو نوسی و داوای لێخۆشبوونی کرد تا کەسێك بنێرێت بۆ ئەوەی شارەکەی پێ بسپێرێت. خوسرەو ئەو کارەی کرد و لێی خۆشبوو.

پاشا فیروز لە سول و ئالان بینایەکی دروست کردبوو تا بەهۆیەوە پارێزگاری لەوڵات بکات و هاوشێوەی قەلا کەلکی لێوەربگرێت. قوباد شتێکی پێ زیاد کرد و کاتێك خوسرەو ئەنەوشیروان بەپاشایەتی گەشت، لە سول و گورگان چەندین بینا و

قەڵای دروست کرد و بەهۆیانەوە وڵاتەکەی پاراست.

ئەوسا سیجیوەر (سجیو) خاقان مەبەستی وڵاتی ئەوی کرد. ئەو سەرکردەی تورکان بوو. خەزران و ئەبخازیان و بەلەنجەریەکانی پەیوەستی خۆی کرد و ئەوان ملکەچی بوون. بەسوپایەکی بێ ژمار هێرشی کردە سەر ئێران. نامەی بۆ ئەنەوشیروان نوسی و داوای باجی لێکرد و ئاگاداری کردەوە ئەگەر باج نەدات، فڵان کار و فیسارە کار دەکات. خوسرەو بەهیچ یەك لەخواستەکانی رازی نەبوو چوونکە وڵاتەکەی بەهێز و سنوری ئەرمەنستانی بەهێز و قایم کردبوو. ئەنەوشیروان بەژمارەیەکی کەم بەسەندەی کرد و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت. خاقان مەبەستی ئەوی کرد بەڵام کارێکی پێنەکرا و بێ هیوا گەرایەوە. ئەم خاقانە ئەو کەسە بوو (ورد)پاشای هیپتالیەکانی کوشت و بەشێکی بەربڵاوی لەوڵاتەکەی ئەوان گرت.

## فەرمانرەوایی خوسرەو ئەنەوشیروان لەسەرزەمینی رۆم

لەنێوان خوسرەو ئەنەوشیروان و غتیانوس پاشای رۆم، شەڕ فەرمانرەوا بوو. لەیەکێك لەرۆژەکانی ئەم شەڕە، لەنێوان پیاوێك لەعەرەب بەناوی خالد کوڕی جەبلە (فەرمانرەوای عەرەبەکانی شان لەلایەن غتیانوس) و پیاوێك لە لەخم بەناوی مونزەر کوڕی نەعمان (فەرمانرەوای عەمان و بەحرەین و یەمامە و تائیف و شوێنەکانیتری حیجاز لەلایەن خوسرەو) ئاژاوەیەك هەڵیکرد. خالد هێرشی کردە سەر کوڕی نەعمان و ژمارەیەکی زۆری لەهاوەڵانی کوشت و سامان و داراییەکانی تاڵان کرد. خوسرەو نامەی بۆ غتیانوس نوسی و پەیمانی ئاشتی خۆی لەگەڵ ئەودا بیرهێنایەوە و ئاگاداری کردەوە کە مونزەر لەلایەن خالدەوە چی بەسەر هاتووە. داوای لێکرد فەرمان بەخالد بدات شامانەکان بۆ خاوەنەکانی بگەرێنێتەوە و خوێنبایی کوژراوەکان بدات و مافی مونزەر لەخالد وەربگرێت. ئەگەر ئەو کارە نەکات پەیمانی ئاشتی شکاندووە. ئەو بەردەوام بۆ تۆڵەسەندنەوەی مونزەر لەخالد نامەی نوسی بەڵام ئەو گرنگی پێ نەدان.

خوسرەو ئەنەوشیروان بۆ شەڕ ئامادەبوو. لەگەڵ حەفتا و چەند هەزار پیاوی شەڕکەر هێرشی کردە سەر غتیانوس. رێگای ئەو لەجزیرەوە بوو. ئەو لەسەر رێگای

خۆی شارەکانی دارا و رەهای گرت و سەرزەمینی شامی بڕی و دەستی بەسەر منبەج و حەلەب و ئەنتاکیە (باشترین شارەکانی شام) گرت. هەروەها فامیە، حومس و زۆربەی شارەکانی دەوروبەری ئەم شارانەی بەزۆری شمشێر گرت و سامان و داراییەکانی تالآن کرد. دانیشتوانی ئەنتاکیەی بەدیلی گرت و ئەوانی بۆ سواد کۆچ پێکرد و فەرمانیدا لای تیسفون شارێکیان هاوشێوەی ئەنتاکیەیان بۆ دروست بکەن و ئەوانی تیا نیشتەجێ بکەن. ئەمە ئەو شارەیە بە رۆمیە ناودەبرێت. پێنج تسوجی بۆ دیاری کرد: نەهرەوانی سەرەوە، نەهرەوانی ناوەراست، نەهرەوانی خوارەوە، بادرایا و باکسایا. بۆ دیلەکان رۆژی و ساز و بەرگی شەڕی دیاری کرد و سەرپەرەستی ئەوانی بەپیاوێك لەمەسیحیەکانی ئەهوازدا تا بەهۆی هاودینییەوە ئارام بگرن. عتیانوس شارەکانیتری شامی بەسامان و دارایی زۆر کڕییەوە و پەیمانیدا سالآنە باجی بۆ بنێرێت بەو مەرجەی ئەنەوشیروان هێرش نەکاتە سەر ولآتەکەی. هەر ساڵ باجیان بۆ ئەنەوشیروان دەبرد.

ئەنەوشیروان لەرۆمەوە هێرشی کردە سەر خەزران و ئەوانی کشتار و تالآن کرد و دادی مسکێنەکانی خۆی وەرگرت. دواتر مەبەستی یەمەنی کرد و لەوێش دەستی بۆ کوشتار و تالآن کردنی خەڵك درێژ کرد و گەرایەوە بۆ مەداین لەکاتێکدا لوتکە و سەرزەمینەکانی ئەوێ و سنوری بەحرەین و عەممانی گرتبوو. نەعمان کوڕی مونزەری کردە پاشای حیرە و رێزی لێگرت و دواتر رۆشتە شەڕی هیپتالیەکان تا تۆڵەی باوەگەورێی خۆی فیروز وەربگرێت. خوسرەو رۆشتە سەرزەمینی هیپتالیەکان و پاشاکەیانی کوشت و بنەماڵەکەی روخاند و لەبەلخ و ماوەرالنهر تێپەری و سوپاکەی خۆی لەفەرغانە دابەزاند و دواتر بۆ مەداین گەرایەوە و لەشکرەکەی خۆی نارد بۆ یەمەن کەحەبەشیەکانیان کوشت و ئەم ولآتەیشیان داگیر کرد.

رۆژگاری پاشایەتی ئەو چل و هەشت یا چل و حەوت ساڵی خایاند.

لەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلام لەرۆژگاری ئەودا بوو. دەڵێن: عەبدوللە کوڕی عەبدالموتەلیب لەبیست و چوار ساڵی پاشایەتی ئەنەوشیروان لەدایك بوو و پێغەمبەر لەچل و دووەمین ساڵی پاشایەتی ئەو.

هشام کوڕی کەلبی دەڵێت: فەرمانرەوایی بەسەر عەرەبەکان لەلایەن ئێرانییەکان

بەمشێوە بوو: ئەسوەد کوڕی مونزەر، براکەی مونزەر کوڕی مونزەر کوڕی نەعمان حەوت ساڵ، نەعمان کوڕی ئەسوەد چوار ساڵ، باوکی یەعفەر کوڕی عەلقەمە کوڕی مالك کوڕی عودەی لەخمی سێ ساڵ، مونزەر کوڕی ئەمری القەیسی یەکەم چل و نۆ ساڵ، نازناوی ئەو دوشاخدار (زو القرنین) بوو و ئەمە بەهۆی دو پرچەوەیە کە لەهەردولای سەری خۆی دەیهۆنییەوە. دایکی ماویە کچی عەمرۆ کوڕی جەشم کوڕی ئەمر کوڕی قاست ناسراو بەناوی مط السما (ئاوی ئاسمان، لەبەر جوانی زۆر) بوو، کورەکەی عەمرۆ کوڕی مونزەر شەش ساڵ، دەڵێت هەشت ساڵ و هەشت مانگ لەفەرمانرەوایی ئەمەیان (مونزەر کوڕی ئەمری القیس) تێپەری کەپێغەمبەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا و ئەمە لەساڵی (عام الفیل) لەرۆژگاری خوسرەو ئەنەوشیرواندا رویدا.

کاتێك سەرزەمینی یەمەن ملکەچی خوسرەو بوو، یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی لەگەڵ سوپایەکی بەهێز بۆ سەرەندیبی هیند (سەرزەمینی گەوهەر)نارد کەشەڕی لەگەڵ پاشای ئەو سەرزەمینە کرد و کوشتی و سامان و دارایی زۆری بۆ ئەنەوشیروان ناردەوە. لەو کاتەدا لەسەرزەمینی ئێران کەمتیار نەبوو و کەمتیارەکان لەرۆژگاری ئەنەوشیروان لەولاَتانی تورکەوە رویان کردە ئەم سەرزەمینە. ئەم کارە لای خوسرەو گران و موبدی موبدەکانی بانگ کرد و پێی وت: هەواڵمان پێگەشتووە ئەم درندانە رویان کردۆتە سەرزەمینی ئێمە و ئێمە بەگرانی دەزانین، باوەری خۆتان لەمبارەوە بەئێمە بڵێ. وتی: لەپیاوانی دینیمان بیستومە کەدەیانوت: هەرکات داد بەسەر بێداد زاڵ نەبێت و خەڵکانی سەرزەمینێك ستەم لەیەك بکەن، دوژمنەکانیان هێرشیان دەکەنەسەر و ئەو بەلاَیان بەسەردێت کەئارەزومەند و خوازیاری نین. ئەوەندەی نەخایاند هەواڵ بەخوسرەو گەشت کە لاوە تورك نەژادەکان هێرشیان کردۆتە دوورترین بەشەکانی ولاَتەکەی. ئەو فەرمانی بەوەزیر و کاربەدەستانی خۆیدا لەوەی دەیکەن پێ لەراستی نەبەنەدەر و هەرکارێك لەسەر بنەمای دادپەروەری ئە نجام بدەن. ئەوان ئەم کارەیان کرد و خوا دوژمنەکانی بێ شەڕ لەولاَتەکەیان دور خستەوە.

## کارەکانی ئەنەوشیروان لەئەرمەنستان و ئازەربایجان

بەشێك لەئەرمەنستان و ئازەربایجان ملکی رۆمیەکان و بەشەکەیتری بەدەست خەزەرەکانەوە بوو. قوباد لەدەوری ئەو بەشانەی پەیوەستی ئێران بوو، بوورجێکی دروست کرد. کاتێك قوباد مرد و کورەکەی ئەنەوشیروان بەپاشایەتی گەشت، هێرشی کردە سەر بورجان و فەرغانە و گەرایەوە و شارەکانی شابەران و مەسقەت دەروازەی دەروازەکانی (باب الابوواب) دروست کرد. بۆیە ناویان ناوە دەروازەی دەروازەکان چوونکە لەسەر رێگەیەکی کوێستانی دروست کرابوو و چەندین دەروازەی بۆ دانرا و لەسەر هەردەروازەیەك کۆشکێکی بەهێز لەبەرد دەبینرا. ئەو لەم شارەدا خەڵکانێکی بەناوی (سیاسجین) (نەساجین، نەشاستجین، نشەتگان؟ سەناسنجین)ی نیشتەجێ کرد. لەسەرزەمینی جوزران (خوراسان، غەوزان) شاری سەغدبیلی بنیاتنا و سەغدییەکان و پارسیەکانی بۆ ئەوێ کۆچ پێکرد. هەروەها شاری باب اللدانی (دەروازەی ئالان) دروست کرد و هەموو سەرزەمینەکانی ئەرمەنستان کە لەدەست رۆمیەکاندابوو، داگیری کرد و شاری ئەردەبیل و ژمارەیەك لە قەلاَکانی ئاوەدان کردەوە. نامەی بۆ پاشای تورکان نوسی و خوازیاری ئاشتی و برایەتی بوو و کچەکەی بۆ خۆی داوا کرد و داوای خزمایەتی کرد و هەرکام کچی خۆی دابەویتر.خوسرەو ئەنەوشیروان کچێکی بۆ خاقانی تورك نارد کەیەکێك لەهاوسەرەکانی وەك کچی خۆی هەڵیگرتبوویەوە. وای نیشاندا کەکچی خۆیەتی. پاشای تورك کچی خۆی نارد. ئەوان چاویان بەیەك کەوت. ئەنەوشیروان فەرمانی بەژمارەیەك لەپیاوە باوەرپێکراوەکانی خۆیدا هێرش بکەنە سەر تورکەکان و بیانخەنە ناو ئاگرەوە. ئەو کارەیان کرد و کاتێك بەیانی بوویەوە، پاشای تورك لەم کارەگلەیی کرد و ئەنەوشیروان وتی ئاگاداری ئەو کارە نییە. دوای چەند شەوێکیتر ئەو کارەی دوبارە کردەوە و پاشای تورك دوبارەی گلەیی و گازندەی کرد و ئەنوشیروان داوای لێبووردنی لێکرد. دواتر ئەنەوشیروان وتی لەبەشێك لە لەشکرەکەی خۆی کە کەپری دروست کراو لەگیای وشك بوو، ئاگر بکەنەوە.

بۆبەیانی گلەیی لەپاشای تورك كرد و وتی: منت لەسەر بنەمای تۆمەت سزادا!. پاشای تورك سوێندی خوارد كەبەهیچ جۆرێك ئاگاداری ئەو كارە نییە. ئەنەوشیروان وتی: لەشكرەكەی من و تۆ لەپەیمانی ئاشتی ئێمە توورەن چوونكە بەخشش و تالآنی لەگۆردا نییە. دەترسم كارێكی نەشیاو بكەن و دوبارە دۆستایەتیمان بۆ دوژمنایەتی بگۆڕێت. چارە ئەوەیە فەرمانێك بدەیت تامن دیوارێك لەنێوان خۆم و تۆ دروست و دەروازەكانی تیا جێگر بكەم. بۆ لای تۆ كەس نەیێت مەگەر ئەوەی تۆ داوای بكەیت وبۆ لای ئێمە كەس نەیێت مەگەر ئەوەی ئێمە داوای بكەین. پاشای توركان رازی بوو.

ئەنەوشیروان لە قەراغ دەریا تا كوێستانەكان دیواری دروست كرد و درگای ئاسنی بۆدانا و پاسەوانانی بۆ پاسەوانی كردن راسپارد. بە پاشای توركیان وت: ئەنەوشیروان فریوی دای و لەبەردەم تۆ دیوارێكی بەهێزی دروست كرد و تۆ نەتوانی چارەی ئەو بكەیت.

ئەوسا ئەنەوشیروان پاشاكانی لەسەر شوێنە جیاوازەكان دانا و (خاوەنانی تەخت) پیلان شا، لەكز، مەسقەت و .. لەنێوانیاندا بوون. ئەرمەنستان لەدەست ئێرانییەكاندا بوو تا ئیسلام دەركەوت و زۆر لەسیاسجین لەقەلآ و شارەكانی خۆیان نارازی و لێی هاتنەدەر تا ئەوێ بوو بەوێرانە و خەزەرەان و رۆمیەكان دەستیان بەسەردا گرت. كاتێك ئیسلام هات، ئەوان لەوێ بوون.

## داستانی فیل سواران

کاتێك پاشایەتی ئەبرەهە درێژەی کێشا و ئەو دەستی بەسەر سەراسەری یەمەندا گرت، لە شاری سەنعا (قەلیس)ی دروست کرد.ئەمە کەنیسەیەك بوو هاوتاکەی لەسەر زەوی نەبینراوە. دواتر بۆ نەجاشی نوسی: بۆ تۆ کەنیسەیەکم دروست کرد کەهاوتای نییە. کار بەجێ ناهێڵم تائەوەی روی حاجیانی عەرەب دەکەمە ئێرە.

کاتێك عەرەبەکان ئەمەیان بیست پیاوێك لە(نەسا)کاران لەمناڵەکانی فوقەیم تورەبوو . رۆشتە ناو ئەو کەنیسە و پیسایی تیا کرد و دواتر گەرایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی. ئەبرەهەیان لەم کارە ئاگادار کردەوە و پێیان وت: ئەو پیاوێك لەکەسانی بنەماڵەیەك لە مەککەیە کە عەرەبەکان حەجیان لا دەکەن. کاتێك بیستی تۆ دەتەوێت حاجیان روبکەنە ئێرە، تورەبوو و کەنیسەکەی تۆی بە پیسایی پیس کرد. ئەبرهەی توورە، سوێندی خوارد بێ گومان دەرواتە مەککە و کەعبە وێران دەکات. فەرمانیدا حەبەشیەکان ئامادە شەڕ بن. سوار لەسەر فیلێك بەناوی مەحمود هاتەدەر. دەستەیەك دەڵێن: ئەو سیانزە فیلی بوو کەبەدوای مەحمودەوە بوون. خوای گەورەی بۆیە فیلی بە تاك هێناوە چوونکە مەبەستی فیلە گەورەکەی ئەوان مەحمودە. لەبارەی ژمارەی ئەوان ئاماژە بەوتاری تریش دراوە.

کاتێك بەرێکەوت، عەرەبەکان بیستیان و دژایەتی کردنی ئەویان بەمافێکی رەوای خۆیان زانی. پیاوێك لەگەورەکانی عەرەب بەناوی زونەفەر روبەروی بوویەوە بەڵام شکستی خوارد و بەدیلی گیرا. ئەبرەهە ویستی بیکوژێت بەڵام لای خۆی لەزینداندا هێشتییەوە. ئەوسا درێژەی بەرێگای خۆیدا. نۆفەیل کوڕی حەبیب خەسعەمی روبەروی بوویەوە و شکستی خوارد وگرفتار بوو. ئەو پەیمانی بەئەبرەهەدا رێگای نیشان بدات. ئەبرەهە ئەوی هێشتەوە و درێژەی بەرێگای خۆیدا. کاتێك گەشتە تائف، خەڵکانی سەقیف، باوکی رەغاڵیان لەگەڵدا نارد تا رێگەی نیشان بدات. ئەو رۆشت و لەموغەمەس دابەزی. لێرەدا باوکی رەغاڵ مرد و عەرەبەکان گۆری ئەویان بەرد باران کرد و ئەمە ئەو گۆرەیە بەردەوام بەردبارانی

دەکەن.

ئەبەرهە پێش خۆی، ئەسوەد کوڕی مەقسودی بۆ مەککە نارد و سامانی دانیشتوانی ئەوێی تالآن کرد و لەو ناوەدا دوسەد وشتری عەبدولموتەلب کوڕی هاشمی گرت. ئەوسا ئەبرەهە حوناتەی حەمیری بۆ مەککە نارد وپێی وت: بەدوای گەورەی قورەیش بگەرێ و پێی بلێ من بۆشەڕ لەگەڵ ئێوە نەهاتووم بەڵکو بۆ وێران کردنی کەعبە روم کردۆتە ئێرە. ئەگەر پارێزگاری لێنەکەن، پێویستم بەشەڕلەگەڵ ئێوە نییە.

کاتێك پەیامەکەی بەعەبدولموتەلب گەشت، وتی: سوێند بەخوا ئێمە مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئەومان نییە. ئەمە ماڵی خوا و هاورێی ئەو ئیبراهیمە. ئەگەر پارێزگاری لێبکات ماڵ و بارەگای خۆی پاراستووە و ئەگەر تەسلیمی دوژمنەکەی خۆی بکات، ئێمە کارمان بە پارێزگاری کردن لەو نییە.

عەبدولموتەلب بەنێردراوەکەی وت: من ببە بۆلای پاشا. ئەو لەگەڵ عەبدولموتەلب بەرێکەوت تا گەشتە ناو لەشکر و عەبدولموتەلب پرسیاری زونەفەری کرد کەهاورێی بوو. پرسی: ئایا دەتوانی لەوەی بەسەرمان هاتووە، هاوکاریمان بکەیت؟ زونەفەر وتی: پیاوێکی دیل کە لەدەست پاشایەك گرفتارە و چاوەروانی مەرگ دەکات، چۆن دەتوانێت هاوکاری ئێوە بکات؟ بەلآم ئەنیسی فیلدار هاورێمە. بۆ کارەکەی تۆ رایدەسپێرم و تۆ بەگەورە و داوای لێدەکەم لای پاشا مۆڵەتی بینین بۆ تۆ وەربگرێت و ئەو، ئەگەر بتوانێت نێوەنجیگەری بکات. عەبدولموتەلب وتی: بەسمە. زونەفەر پەیك و پەیامی بۆ لای ئەنیس نارد و ئاگاداری کردەوە کە ئەو گەورەی قورەیشە و مۆڵەتی دەوێت تا چاوی بەپاشا بکەوێت. ئەبرەهە مۆڵەتی پێدا.

عەبدولموتەلب پیاوێکی گەورە، رێزدار و روخۆش بوو. کاتێك ئەبرەهە بینی، رێزی لێگرت. لەتەخت هاتەخوار و لەسەر فەرش لای ئەو دانیشت و بەوەرگێرەکانی خۆی وت: بپرسن نیازەکەی چییە. وەرگێر ئەمەی وت و عەبدولموتەلب وتی: نیازم ئەوەیە دووسەد وشترەکەم بۆ بگەرێنیتەوە. ئەبرەهە بەوەرگێرەکەی وت: کاتێك تۆم

بینی شاد بووم و خۆشم ویستی و کاتێك قسەت کرد، لێت سڵەمیمەوە. ئایا لەگەڵ من سەبارەت بەوشترەکانی خۆت قسە دەکەیت و لەو ماڵەی دینی تۆ و دینی باوکانی تۆیە و من بۆ وێران کردنی هاتووم، بێدەنگ دەبیت؟ وتی: من خاوەنی وشترەکانم. کەعبە خواوەندێکی هەیە و پارێزگاری لێبکات. ئەبرەهە وتی: ئەو بێ هیوا نابێت لای من بگەڕێتەوە. فەرمووی: وشترەکانی بۆ بگێرنەوە. کاتێك وشترەکانی وەرگرتەوە، پەتی کردە ملیان و کردیە قوربانی مەککە و لە بارەگای خوایی بەرەلای کردن تا زیانیان بەرکەوێت و خوا تورە بێت. ئەوسا گەرایەوە بۆ لای قورەیشیەکان و بەسەرهاتەکەی بۆ گێرانەوە و فەرمووی لەگەڵ ئەودا لەمەککە بێنەدەر و بۆ ئەوەی زیانیان بەرنەکەوێت رووبکەنە کوێستان. ئەوسا هەستا و ئاڵقەی دەرگای کەعبەی گرت و ژمارەیەك لەقورەیشیەکان لەگەڵ ئەو هەستان و لەخواپارانەوە و داوای شکانی ئەبرەهەیان کرد. عەبدولموتەلب ئاڵقەی دەرگای کەعبەی گرت و وتی:

| | |
|---|---|
| یا رب لا ارجولهم سواکا | یا رب فامنعه منهم حماکا |
| ان عدو البیت من عاداکا | امنعهم ان یخربووا فناکا |

واتاکەی:

خوایە جگە لەتۆ هیوام بەکەس نییە. خوایە بارەگای خۆت لەزیانی ئەوان بپارێزە. دوژمنی کەعبە، دوژمنی تۆیە. رێگەمەدە ئەوان ماڵەکەت وێران بکەن.

هەروەها وتی:

| | |
|---|---|
| لاهم ان العبد یم | منع رحلة فامنع حلالك |
| لا یغلکوري صلیبهم | ومحالهم غدرا محالك |
| و لئن فعلت فانه | امر تتم به فعا لك |
| انت الذی ان جاءبا | غ نرتجیك له كذلك |
| ولوا و لم یحو و اسوی | خزی و تهلكم هنالك |
| لم استمع یوما بار | جس منهم یبغوا قتالك |

جروا جموع بلا دهم  والفيل كي يسبووا عيالك

عمدوا حماك بكيدهم  جهلا و مارقبوو جلالك

واتاكەی:

خواوەندا، هەر بەندەیەك پارێزگاری لەباروبنەی خۆی دەكات، تۆ پارێزگاری لەبارەگای خۆت بكە. با خاچ و هێزی ئەوان بەسەر هێزی تۆدا زاڵ نەبێت. ئەگەر ئەم كارە بكەیت، كارێكە كۆتایی بەكارەكانی خۆت دێنیت. گەرانەوە و جگە لەریسوایی و لەناوچون هیچیان لەگەڵ خۆیان نەبرد. هیچ كات گلاّوتر لەوانم نەبینیوە چوونكە مەبەستی شەڕ لەگەڵ تۆیان هەیە. سوپای وڵاتەكەی خۆیان و فیلەكانیان كۆكردەوە تا بنەماڵەكەی تۆ دیل بكەن. ئەمان بە فریو و نەزانی خۆیان مەبەستی بارەگای تۆیان كردووە و ڕێزیان لەگەورەیی تۆ نەگرت.

ئەوكات ئاڵقەی درگای كەعبەی بەردا و لەگەڵ قورەیشیەكان بەرێكەوت و هەموویان رۆشتنە كەلێنی كێوەكان و لەوێ پەنایان گرت و دەیانروانی تا بزانن كاتێك ئەبرەهە دێت، چی بەسەر مەككەدا دێنێت.

كاتێك ئەبرەهە شەوی كردە رۆژ، ئامادە رۆشتنە ناو مەككە بوو و فیلەكەی خۆی مەحمودی تەیار كرد. ئەو دەیویست كەعبە وێران بكات و بۆ یەمەن بگرێتەوە. كاتێك فیلیان بەرێخست، نوفەیل كوڕی حەبیب خەسعەمی هات و گوێی گرت و وتی: ئەی مەحمود، بۆ ئەو شوێنەی هاتوی بگەڕێرەوە كە تۆ لەبارەگای پیرۆزی خوایت. ئەوسا گوێچكەی بەردا. فیل خۆی خستە سەر زەوی و نوفەیل بەپەلە بەرەو كێوەكە رۆشت. لەفیلیان دا بەلاّم نەجولاّ. رویان كردە یەمەن، فیل هەستا و دەستی بەراكردن كرد، رویان كردە شام، ئەو كارەی كرد، رویان كردە رۆژهەلاّت، هەمان كارو كاتێك رویان كردە مەككە، كەوتە سەرزەوی. خوا بۆ ئەوان باڵندەكانی ئەبابیلی لەدەریاوە نارد و ئەوانە باڵندەی هاوشێوەی شەمشەمە كوێرە بوون كە هەركام سێ بەردیان هەلگرتبوو: یەكیان بەدەنوك و دووانیان بەچنگ. بەردەكانیان بەسەر سوپای ئەبرەهەدا باراند. هەر بەردێك بەئەندازەی نۆك یا ماشێك بوو و بەرهەركەس دەكەوت، دەستبەجێ گیانی دەدا. هەموویان لەو بەردانەیان بەركەوت.

خوا لافاویشی نارد و ئەوانی راماڵی و بۆ دەریایی بردن. ئەوانەی رزگار بوون هاوڕێ لەگەڵ ئەبرەهە رایان کرد و رویان کردە یەمەن و لەنوفەیل کوڕی حەبیبیان دەپرسی تا رێگەیان نیشان بدات. کاتێك نوفەیل بینی خوا چ ئەشکەنجەیەکی بەسەردا داباراندن، وتی:

لین المفرو تلا له الطالب    و الا شرم المغلوب لیس الغالب

واتاکەی:

شوێنی راکردن کوێیە کە ئەوەی بەدواتانا دەگەڕێت خوایە. و لوت براو تێکشکاوە نەسەرکەوتوو.

هەروەها وتی:

الا حییت عنا یا ردینا    نعمناکم مع الاصباح عینا

اتانا قابس منکم عشاء    فلم یقدر لقا بسکم لدینا

ردینة لو رایت و لم تریه    لدي جنب المصعب ما راینا

اذا لعذرتنی و حمدت رایی    و لم تأسی لما قدفات بینا

حمدت الله اذ علینت طیرا    و خفت حجارة تلقی علینا

و کل القوم یسأل عن نفیل    کأن علی للحشبان دینا

واتاکەی:

ها، سلاو لەئێمە بێت ئەی رەدینە، بەهەلاتنی بەرەبەیان چاوەکانمان بەئێوە روناك بوویەوە. شەوانە ئاگرخوازێك لای ئێوە هاتە لای ئێمە و ئێمە نەمانتوانی بۆ ئەو کارێك بکەین. ئەی رەدینە، ئەگەر ئەوەی ئێمە لای ئەو بەردەلانە بینیمان بینیبووتان (کە نەتانبینی) لەم کاتەدا بەداوای لێخۆشبوونی من رازی دەبوویت و باوەری بەباوەڕی من دەهێنا. بۆ ئەوەی لەدەست ئێمەدا نەماوە، داخ ناخۆێت. خوامان سپاس کرد کاتێك باڵندەکانمان بینی و لەبەردێك دەترسایین بەرسەرمان کەوێت. هەمووی ئەم خەڵکە بەدوای نوفەیلدا دەگەڕێن. دەڵێی من قەرزاری حەبەشیەکانم.

ئەبەرهە لەجەستەیدا زیانی بەرکەوت بەشێوەیەك ئەندامەکانی یەك یەك دارزان و کاتێك ئەویان بردە سەنعا، لەجوجکێکی بێ پەڕ دەچوو. ماتێك مرد، سینەی قەڵشی برد و دڵی کەوتە خوار.

کاتێك ئەبرەهە مرد، کورەکەی یەکسوم کوڕی ئەبرەهە بوو بەپاشا. ئەبرهەیان بەناوی ئەو بەباوکی یەکسوم ناودەبرد. یەمەنییەکان و حەمیرییەکان ملکەچی بوون. حەبەشیەکان ژنانی ئەوانیان بەهاوسەری گرت و پیاوەکانیان کوشت و کورەکانیان وەك وەرگێر لەنێوان خۆیان و عەرەبەکان بەکار برد.

کاتێك خوا حەبەشییەکانی لەناوبرد و پاشاکەیان هاورێ لەگەڵ رزگاربووان گەرایەوە بۆ یەمەن، عەبدولموتەلب بەیانی ئەو رۆژە هاتەخوار تا بزانن چی دەکەن. باوکی مەسعودی سەقەفی لەگەڵیابوو. ئەو دووانە هیچ دەنگێکیان نەبیست. هاتنە شوێنی لەشکرەکەی ئەوان و هەموویان بەکوژراو بینی. عەبدولموتەلب دوو چاڵی بۆ خۆی و باوکی مەسعود هەڵکەند. هەردوکیان پڕ بوون لەزێر. بانگی خەڵکی کرد و گەرانەوە و لەبەخشینەکانی ئەوان کەڵکیان وەرگرت. عەبدولموتەلب تا کۆتایی تەمەنی بەهۆی ئەو زێر وزیوانە بێ نیاز ژیانی بەسەر برد.

خوا لافاوی نارد وحەبەشیەکانی رامالّی و هەموویانی لەناو برد. کاتێك خوا حەبەشیەکانی لەکەعبە دوور کردەوە و ئەو گرفتارییەی بەسەردا هێنان، عەرەبەکان رێزیان لەقورەیشیەکان گرت و وتیان: بنەماڵەی خوا لەبەرژوەندی ئەوان شەڕی کرد. دواتر یەکسوم مرد و لەجیاتی ئەو براکەی مەسروق هاتە سەر تەخت.

## گەرانەوەی یەمەن بۆ حەمیریەکان و دەرپەراندنی حەبەشیەکان

کاتێك یەکسوم مرد، براکەی مەسروق کوڕی ئەبرەهە بووە پاشای یەمەن. ئەو هەمان کەسە بەدەستی وەهرەز کوژرا. کاتێك گرفتاری خەڵکانی یەمەن دژوار بوو، سەیف کوڕی زی یەزن هاتەدەر و مەبەستی سزاری رۆمی کرد و پشتی کردە خوسرەو ئەنەوشیروان. هۆکاری پشت کردن لەئەنەوشیروان ئەوە بوو پاشای ئێران لەهاوکاری کردنی باوکی سستی کرد. کاتێك ژنەکەیان بەزۆر لەو داگیر کرد، روی کردە دەرباری خوسرەو ئەنەوشیروان و بۆ روبەروبوونەوەی حەبەشیەکان داوای هاوکاری لێکرد. خوسرەو مزگێنی پێدا بەڵام نەیخستە بواری جێبەجێ کردنەوە و زی یەزن لای ئەو مایەوە و لای ئەو مرد. کورکەی سەیف لەداوێنی ئەبرەهە پەروەردە کرابوو و گومانی دەکرد کوڕی ئەوە. رۆژێك یەکێك لەکورەکانی ئەبرەهە جنێوی بەخۆی و باوکی دا. هاتە لای دایکی و پرسی: باوکم کێیە؟ دوای چەند جارێك هاتوچۆ لەنێوان ئەم دووانە، دایکی راستیەکانی پێوت و ئەوی لەباوکی ئاگادار کردەوە. ئەو مایەوە تا ئەبرەهە مرد وکورەکەی یەکسوم هاتەسەر کار و ئەویش مرد. سەیف کوڕی زی یەزن دوای ئاگادار بوون لەرەچەڵەکی خۆی، رۆشتە رۆم بەڵام مەبەستەکەی لە دەرباری رۆم بەدەست نەهێنا چوونکە لەگەڵ حەبەشیەکان هاودین بوون. ئەو دووبارە گەرایەوە لای خوسرەو. رۆژێك کەسوار ببوو، رێگەی لێگرت و وتی: ئەی شا، لای تۆ مافێکی مردووم هەیە. شا دابەزی و وتی: کێیت و مافت چییە؟ وتی: کوڕی ئەو پیرەپیاوە یەمانییەم کە مژدی هاوکاریت پێدا و لەدەرباری تۆ مرد. ئەو مژدەیە مافی منە. خوسرەو دڵی بۆی سوتا و پێی وت: ولأتی تۆ لەئێمە دوورە و داهاتی کەم. رێگاکەی دژوارە و من لەشکری خۆم ناخەمە مەترسییەوە. فەرمانیدا سیم و زێریان پێدا. سەیف کوڕی زی یەزن هاتەدەر و دەستی بە بەخشینی سیم و زێر کرد بەرادیەیەك خەڵکی بێ نیاز بوون. خوسرەو بیستی و وتی: بۆ لەگەڵ پێدراوی شایی ئەم کارەت کرد. وتی: بۆ زێر نەهاتووم بەڵکو بۆ پیاوانی شەڕکەر. ولأتی ئێمە پڕە لە زێر و زیو.

خوسرەو لەوتارەکەی سەریسورما و وتی: ئەو داماوە گومان دەکات وڵات و سەرزەمینەکەی خۆی باشتر لەمن دەناسێت! ئەو لەگەڵ وەزیرەکانی خۆی راوێژی کرد کە لەشکر بنێرێت یا نەینێرێت. موبدی موبدەکان وتی: ئەی شا، ئەم کورە مافی رووکردنە تۆی هەیە کەمژدەی هاوکاریشت بەباوکی دا و ئەو لەدەرباری تۆ مردووە. لەزیندانەکانی تۆ پیاوانی بەهێز و تێکۆشەری زۆر هەیە. ئەگەر شا بخوازێت، ئەوانی لەگەڵدا بنێرێت. ئەگەر سەرکەوتن لەبەرژەوەندی پاشا دەبێت و ئەگەر بمرن لەوان رزگاری دەبێت و خەڵکی وڵاتەکەی لەوان رزگار دەکات. خوسرەو وتی: باوەری راست ئەمەیە. فەرمانیدا زیندانییەکان بێنن و ژمارديان کەنزیکەی هەشسەد کەس بوون. ئەو یەکێك لە فەرماندەکانی خۆی بەناوی وەهرەزی کردە فەرماندەیان کەخۆیشی لەناو زیندانییەکاندا بوو. ئەویان لەگەڵ هەزار سوار بەبەرابەر دەزانی. فەرموی ئەوانیان لەهەشت کەشتیدا سوار کرد و رویان کردە دەریا. دوو کەشتی لە ئاودا نوقم بوو و سواربووانی کەشتیەکانیتر لەبەستێنی حضر موت دابەزین. خەڵکێکی زۆر دەوری زی یەزنیان گرت. مەسروق بە سەد هزار پیاوی شەرکەر لەحەبەشی و حەمیری و ئەعراب روبەرویان بوویەوە. وەهرەز دەریایی لەپشت سەر بوو. کەشتیەکانی ئاگردا تا هاورێکانی بە هیوایی هەڵاتن و خۆدەرباز کردن نەبن. هەموو خواردن و جل و بەرگەکانی(جگە لەوەی خواردبوویان و لەبەریاندا بوو) سوتاند و بە هاوەڵانی خۆی وت: بۆیە کەشتیەکانم سوتاند تا ئەگەر حەبەشیەکان بەسەرتانا زاڵبوون، دەستیان بەسەردا نەگرن. ئەگەر ئێمە بەسەر ئەواندا سەرکەوین چەند بەرابەر وەردەگرین. ئەگەر لە گەڵ من شەڕ دەکەن و خۆراگری دەکەن، پێم بڵێن و ئەگەر نایکەن، پشت بەم شمشێرە دەبەستم تا نوکەکەی لە پشتم بێتەدەر. ئێستا بزانن ئەگەر فەرماندەکەتان ئەم کارە بکات چی بەسەر ئێوەدا دێت. وتیان: لەگەڵ تۆ شەڕ دەکەین تا هەمووومان بمرین یا سەرکەوین. وەهرەز بە سەیف کوڕی زی یەزنی وت: چیت پێیە؟ سەیف وتی: ئەوەی بتەوێت لەپیاوی شەرکەری عەرەب و شمشێری عەرەب. ئێستا قاچی من بە قاچی خۆتەوە ببەستە تا پێکەوە بمرین یا سەرکەوین. وەهرەز وتی: دادپەروەریت.

سەیف هەرچەندەی توانی لەخەڵکانی خۆی کۆکردەوە. یەکەم خەڵکان

کەپەیوەستی بوون سەکاسێکەکان لە کێندە بوون. مەسروق لەکۆبوونەوەی سوپای نێران و یەمەن ئاگادار بوویەوە و ئەویش لەشکری خۆی کۆکردەوە. وەهرەز هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و وتی: تیر بخەنە ناو کەوان و کاتێك فەرمانم دا، پێکەوە تیربارانیان بکەن.

مەسروق لەگەڵ سوپایەکی گەورەوە هات کە لەزۆریدا ئەملاولاکەی دیار نەبوو. ئەو سوار لەسەر فیل و تاجێك لەسەر و لەسەر ناوچاوی یاقوتێکی سوری بەئەندازەی هێلکەیەك دانابوو. ئەوندە لەخۆبایی بوو جگە لەسەرکەوتن هیچیتری نەدەبینی. چاوەکانی وەهرەز بەهۆی پیری کەمسۆ ببوون. لەبەر ئەمە وتی: گەورەکەیان نیشانی من بدەن. وتیان: سوار لەسەر فیلە. مەسروق سوار ئەسپ بوو. وتیان: ئەو ئەسپ سوارەیە. دوبارە مەسروق لەسەر ئەسپ دابەزی و سوار ئێسترێك بوو. خەڵك بەوەهرەزیان وت: ئەوەی سوار لەسەر ئێسترە. وەهرەز وتی: سوك بوو و پاشایەتییەکەی بەرەو نەمان دەچێت. دوبارە وەهرەز وتی: برۆکانم بەرز بکەنەوە (چوونکە برۆکانی ب هۆی پیری کەوتبوونە سەر چاوی). برۆکانی ئەویان بەدەسماڵێك بەست. ئەوسا تیرێکی ئەستوری خستە ناو کەوان و وتی: مەسروق نیشان بدەن. مەسروقیان نیشاندا و ئەو وتی: ئێستا تیرێکی بۆ دەهاوم. ئەگەر بینیتان هاوەڵانی لەشوێنی خۆیان نەجوڵان، خۆراگر بن تا فەرمانتان پێبدەم چوونکە تیرەکەی بەر نەکەوتووە. ئەگەر بینیتان سوڕان و ئاوڕیان دایەوە، بزانن تیرەکەمی بەر کەوتووە و لەم کاتەدا هێرشیان بکەنە سەر. ئەو تیری هاویشت و لە نێوان دوو چاوی مەسروق نیشتەوە. هاوەڵانی وەهرەز تیربارانیان دەست پێکرد. مەسورق و ژمارەیەك لەسوپاکەی کوژران. مەسروق لە ئێستر کەوتە خوار و هاورێکانی دەوریان گرت. ئێرانییەکان لەناکاو هێرشیان کردە سەریان. حەبەشیەکان جگە لەتێکشکان، چارەنوسێکیان نەبوو. سوپای ئێران تالآنی زۆر و بێ ئەژماریان لەحەبەشیەکان گرت.

وەهرەز وتی: دەست لەعەرەبەکان هەڵگرن و ڕەشەکان بکوژن و یەك کەس لەوان زیندوو مەهێڵنەوە. پیاوێك لەعەرەب شەو ورۆژێك هەڵات و ئەوسا لەتیردانەکەی خۆی تیرێکی بینی. هاواری کرد: ئەی هاوار لە دایکت! دووری ڕێگایە یا درێژی

شوێنی گەرانەوە! وەهرەز رۆشتە ناو سەنعا و دەستی بەسەر یەمەندا گرت و نوێنەرانی خۆی رەوانەی شارەکانیتر کرد.

رۆژگاری پاشایەتی حەبەشیەکان لەسەر یەمەن حەفتا و دو ساڵی خایاند. لەم ماوە چوار پاشا فەرمانرەوایەتیان کرد. ئەریات، ئەبرەهە، یەکسوم و مەسروق. دەستەیەك دەڵێن: نزیکەی دووسەد ساڵ یا زیاتر و یا کەمتر بوو. وتاری یەکەم راستترە.

کاتێك وەهرەز بوو بەپاشای یەمەن، نامەی بۆ خوسرەو نوسی و ئاگاداری کردەوە و سامانەکانی بۆنارد. خوسرەو نامەی بۆ نوسی کەسەیف کوڕی زی یەزن بکاتە فەرمانرەوایی یەمەن( دەستەیەك دەڵێن: مەعدی کەرب کوڕی سەیف زی یەزن بکاتە فەرمانرەوا) وسەراسەری خاکی ولاّتی پێ بسپێرێت. خوسرەو باجی لەسەر دانا تا ساڵانە بۆی بنێرن. وەهرەز ئەوی کردە فەرمانرەوا و بۆ لای خوسرەو گەرایەوە. سەیف بووە پاشای یەمەن و دەستی بەگەران بە دوای حەبەشیەکان کرد. ئەوەندە کارەکەی بەسەختی گرتبوو کەسکی ژنانی سکپڕی هەڵدەدڕی ( و منالی حەبەشی دەردەهێنا و سەری دەبڕی). لەوان ژمارەیەکی کەمی هێشتەوە کە کاری کارەکەری و کۆیلایەتی پێدەکردن. لەپیاوەکانی ئەوان ئەسپ سوارەکانی دروست کرد کەبە ئامرازەکانی شەڕ لە پێشیەوە رایان دەکرد. رۆژگاری ئەو زۆری نەخایاند. رۆژێك هاتەدەر و حەبەشیەکان لە پێشیەوە بەئامرازەکانی شەڕ رایان دەکرد کەلەناکاو هێرشیان کردە سەری و لێیاندا تا مرد. رۆژگاری پاشایەتی ئەو پانزە ساڵی خایاند. لەم کاتەدا پیاوێك لەحەبەشیەکان دژیان راپەری و لەیەمەن دەستی کرد بە کوشت و بڕی خەڵك و تالاّنکاری. کاتێك خوسرەو ئەنەوشیروان ئەم هەواڵەی پێگەشت، وەهرەزی لەگەڵ چوار هەزار پیاو نارد و فەرمانیدا لەیەمەن هیچ رەش یا کوڕی عەرەبی لەرەش بوو نەبینێت مەگەر ئەوەی بیکوژێت چ بچوك بێت چ گەورە. هەر پیاوێك قژی لولی بێت و دەمارێکی رەشی تیا ببینێت، بیکوژێت. وەهرەز بەرێکەوت و هاتە یەمەن و ئەوەی خوسرەو فەرمانی دا بوو ئەنجامیدا و بۆ خوسرەوی نوسی و ئەو، وەهرەزی کردە فەرمانرەوای یەمەن و ساڵانە باجی بۆ دەنارد تا مرد. خوسرەو دوای ئەو کورەکەی مەرزبان کوڕی وەهرەزی کردە پاشا.

دوای ئەو تینجان کوڕی مەرزبان، دوای ئەو خورەخەسرە کوڕی تینجان کوڕی مەرزبان.

دواتر خوسرەو پەرویز لەو تورە و ئەوی لەیەمەن بانگ کردەوە. کاتێك گەشت، یەکێك لەگەورەکانی ئێران میوانداری کرد و شمشێرێکی لە باوکی خوسرەو پەرویز کردە نێومنجیگەر(تا ببێتە هۆکاری پاراستنی ئەو). خوسرەو پەنای دا و لەخوێنی خۆشبوو بەلاَم ئەوی لەفەرمانرەوایی یەمەن لابرد. ئەو بازانی بۆ یەمەن نارد و مایەوە تا خوا پێغەمبەرەکەی محمدی نارد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەنەوشیروان زەرینی دوای وەهرەز کردە پاشا. ئەو پیاوێکی خوێنخۆر بوو. کاتێك دەیویست سوار ئەسپ بێت، یەکێکی دەکوشت و لەسەر لاشەکەیەو تێدەپەری. ئەنەوشیروان مرد و ئەو بەهەمان شێوە پاشای یەمەن بوو. دواتر هورموز ئەوی لەسەر کار لابرد.

لەبارەی نوێنەرانی خوسرەوان لەسەر یەمەن جیاوازی زۆرە کە لە ئاماژەدان پێی سودمان نەبینی.

## کارەکانی قورەیش دوای لەناووچونی فیل سوارەکان

کاتێك روداوی فیل سواران رویدا، قورەیشیەکان لەبەرچاوی عەرەبەکان گەورە بوون و خەڵك ئەوانیان بە بنەماڵەی خوا ناو برد و وتیان: پاشماوەکانی خوان کەئەو پارێزگاریان لێدەکات. قورەیشیەکان کۆبوونەوە و وتیان: ئێمە مناڵەکانی ئیبراهیمین و پاسەوانانی بارەگایی خوایی و پارێزەرانی کەعبە و نیشتەجێ کانی مەککە. هیچ کام لەعەرەبەکان پێگەی ئێمەیان نییە و ئەم ناوبانگە چاکەیان پێنەبراوە. با لەسەر ئاشتی و پێکەوە سازان پەیمان ببەستین کە شتەکانی دەرەوەی حەرەم هاوشێوەی شتەکانی ناوی رێز لێ نەگرین. ئەگەر ئەمانە بەیەك رادە رێزیان بۆ دابنێین، عەرەبەکان ئێمە و بارەگاکەمان بەسوك دەزانن و دەڵێن: قورەیشیەکان ناو حەرەم و دەرەوەی حەرەم وەك یەك رێزی لێدەگرن. لەبەر ئەمە، مانەوە و هاتنەدەرەوەیان لەعەرەفە بەناڕەوا زانی لەگەڵ ئەوەی دەیانزانی و بێزاربوون کەئەم کارانە لەئاینەکانی حەج و سونەتەکانی ئیبراهیمە. لەعەربەکانیتر دەگێرنەوە کەئەوان لەناوی دەمانەوە و نەدەهاتنەدەر. ئەوان وتیان: ئێمە پارێزەرانی حەرەمین و جگە لەو هیچ بەگەورە دانانێن. ئێمە خەڵکانێکی شەیدا و شەیدایی هۆکاری سەختگیری ئێمەیە. ئەوان لەدینی خۆیان سەختگیریان کرد و بۆ هەر کام لەژنانی خۆیان کە لەدەرەوەی حەرەم مناڵیان بێت، ئەو مافەیان دانا کە ئەوان بۆ پارێزگاری کردن لەحەرەم بوویان. لەم کارەدا هۆزەکانی کەنانە، خوزاعە، و عامر شەریکیان بوون و بۆ مناڵەکانی خۆیان ئەو مافەیان بەڕەوا بینی. دوبارە داهێنانێکی تازەیان هێنایە ئاراوە و وتیان: بۆ شەیدایان و سەختگیران ڕەوا نییە لەکاتی ئیحرام کەشك بسوون و کەرە بتوێننەوە و برۆنە ناو ماڵە پەشمینەکان و هەروەها ڕەوا نییە جگە لەیەکێك لەماڵە چەرمینەکان سێبەر بکەن. وتیان: بۆ خەڵك ڕەوا نییە، خواردنێك کە لەگەڵ خۆیان دەیهێنن بۆ حەرەم، ئەگەر حەج یا عەمرە بکەن، لێرەدا بیخۆن. کاتێك بیانەوێت بەدەوری کەعبەدا بسورێنەوە، جگە لەجل و بەرگی شەیدایی نابێت بپۆشن وئەگەر بەدەستی نەهێنن، بەروتی بەدەوری کەعبەدا بسورێنەوە. ئەگەر

یەکێك لەگەورەکانی ئەوان ئەم جلەی دەست نەکەوێت و نەیەوێت و بۆ خۆی بەڕەوا نەبینێت بەروتی بەدەوری کەعبەدا بسورێتەوە، لەجل و بەرگی خۆیدا ئەم کارە بکات و کاتێك تەواو بوو، ئەو جل و بەرگە دانێت و فڕێی بدات و ئەو جل و بەرگە جگە لەو کەسیتر نەدەستی لێبدات و نە لەبەری بکات. بەم جلانەیان دەوت، فڕێدراوەکان.

عەرەبەکان بەم ئایینانە رازی بوون و بەشێوەیەك بەدەوری ماڵی خوا دەسورانەوە کە ئەوان بۆیان دیاری کردبوون. ئەوان خواردنەکانی خۆیان کە لەدەرەوە دەیانێهێنا بەجێ دەهێشت و لەخواردنەکانی حەرەمیان دەکڕی و دەیانخوارد.

ئەمانە تایبەت بوو بەپیاوان. بەڵام ژنان هەموو جلەکانی خۆیان جگە لەروپۆش دەردەهێنا و بەروکراوەیی دەسوڕانە و دەیانوت:

اليوم يبدو بعضه او كله          و ما بدامنه فلا احله

واتاکەی:

ئەمرۆ هەموو یا هەندێك لەو دەردەکەوێت. ئەوەی دەردەکەوێت، بەڕەوای نازانم.

ئەم خەڵکە لەسەر ئەم باوەڕە بوون تا ئەوەی خوا پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی نارد و ئەم ئایینانەی لەناو برد. ئەو لەعەرەفاتەوە بەرێکەوت و بەجل و بەرگێك کە لەدەرەوەی حەرەم لەبەری کردبوو، بەدەوری ماڵی خوادا سوڕایەوە و موسوڵمانان خواردنی دەرەوەی حەرەمیان لەرۆژەکانی حەج کردن لەناو حەرەمدا خوارد و خوای گەورە ئەم ئایەی نارد: کەواتە بگەڕێنەوە لەو رێگاوەی خەڵکان دەگەڕێنەوە و داوای لێ خۆشبوون لەخوا بکەن کەئەو بەخشەر و بەخشندەیە.(بقره/٢/١٩٩). مەبەستەکەی لەخەڵك، عەرەبەکان بوو. دوبارە خوا لەبارەی جل و بەرگ و خواردنی دەرەوەی حەرەم و بەجێهێشتنی لەناو حەرەم، فەرمووی: ئەی منداڵەکانی ئادەم، لای هەر شوێنی نوێژ کردنێك، ئارایشت هەڵگرن و جل بپۆشن و بخۆن و بخۆنەوە بەڵام زێدەرۆیی مەکەن و لەسنور تێمەپەڕن چوونکە خوا زێدەڕۆکانی

خۆش ناوێت. بلێ: کێ زیوەرەکانی خواوەند و ئەم شیرینی و خۆشییانەی خوا کردوویەتی بەرۆژی بەندەکانی خۆی، ناڕەوا کرد و حەرامی کرد؟ بلێ: ئەمانە هەمووی لەم دنیا بۆ خواپەرستانە و لەو دنیایش تایبەتە بەوان. بەم شێوەیە کەوتارەکانی خۆمان دەنێرین و ئەمە هەموو بۆ ئەو کەسانەیە کەزانست و ئاگاییان هەبێت (اعراف/٧/٣٠/٣١).

## پەیمانی خەڵکانی بۆنخۆش و پەیمانی هاودەستەکان

پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە قوسەی بەکورەکەی عەبد الدار چی بەخشی و لەو ناوە: پەردەداری، ئاو دان، میوانداری و هەلگرتنی ئالاً. ئەوسا هاشم و عەبد شەمس و موتەلیب و نوفل و کورەکانی عەبد مەناف کوڕی قوسەی بینیان کەبۆ ئەو پێگانە لەمناڵەکانی عەبدالدار شیاوترن چوونکە لەناو خەڵکەکەی خۆیان لەوان لەپێشتر و گەورەترن. ویستیان ئەمانەیان لێ بستێننەوە. لەم کاتەدا بوو دوبەرەکی و چەند بەرەکی لەناو قوڕەیشییەکان هاتە ئاراوە. دەستەیەك پەیوەستی مناڵەکانی عەبد مەناف بوون و دەستەیەك لەگەڵ مناڵەکانی عەبدالدار کەدەیانوت ڕەوا نییە ئەوەی قوسەی بەوانی بەخشیوە، لەوان وەربگرینەوە چوونکە کارەکانی قوسەی لەناو ئەوان ئایینێکی فەرمانڕەوا بوو کەهەمووان لایەنگیریان لێدەکرد چوونکە ئەو پیاوێکی گەورە و ڕێزدار و پیرۆز بوو و کارەکانی دەبوونە هۆی پیرۆزی. هەڵسورێنەری کاری مناڵەکانی عەبد مەناف کوڕی قوسەی، عەبد شەمس بوو چوونکە گەورەترینی ئەوان و هەڵسورێنەری کاروباری مناڵەکانی عەبدالدار کە بەپارێزگاری کردن لەوان هەستا، عامر کوڕی هاشم (هشام) کوڕی عەبدمەناف کوڕی عەبد الدار بوو. ئەمان دەوری مناڵەکانی عەبد مەنافیان گرت: مناڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدالعزی کوڕی قوسەی، مناڵەکانی زوهرە کوڕی کلاب، مناڵەکانی تەمیم کوڕی مورە و مناڵەکانی حارس کوڕی فەهر کوڕی مالك کوڕی نەزر. ئەمانەیش پەیوەستی مناڵەکانی عەبدالدار بوون: مناڵەکانی مەخزوم، مناڵەکانی سەهم، مناڵەکانی جومح و مناڵەکانی عودەی کوڕی کەعب. عامر کوڕی لۆئەی و مەحارب کوڕی فەهر لەناو ئەوان هاتنەدەر و پشتیوانیان لەهیچ کام نەکرد. هەر کام لەم دوو دەستە لەناو خۆیان پەیمانێکی بەهێزیان بەست تا ئەو کاتەی ئاو هەموو پارچەکە تەر نەکات(جاویدان) لەهاوکاری کردنی یەك درێغ نەکەن و دەست لەپشتیوانی کردنی یەك هەڵنەگرن. مناڵەکانی عەبدمەناف کاسەیەکی پڕ لەگوڵاویان هێنا( یا یەکێك لەژنانی عەبد مەناف هێنای) و لەماڵی خوا دایاننا و دەستیان کردە ناوی و هاوپەیمان و هاودەست بوون و دەستیان لەکەعبە سوو. مەبەست لەم کارە ئەوە بوو

ئەو پەیمانە هەر چی زیاتر بە هێزتر و سەقامگیرتر بکەن. لەبەر ئەمە پێیان دەڵێن (بۆنخۆشەکان) (مطیبین).

منالەکانی عەبدالداریش هاتن و لەگەڵ هۆزەکانی خۆیان لەماڵی کەعبە کۆبوونەوە و پەیمانیان بەست لەهاوکاری کردنی یەك درێغی نەکەن و دەست لەپشتیوانی کردنی یەك هەڵنەگەرن. ئەمانیش پێیان دەڵێن (هاوپەیمانان) (احلاف). ئەوسا هەردوو دەستە بۆ روبەروبوونەوە و شەڕ ریزیان بەست و بریاریان لەسەر شەڕدا. لەو کاتەی رووداني شەڕ نزیك ببوویەوە، داوای ئاشتیان کرد لەسەر ئەو بنەمایەی کاری ئاو گەیاندن و خواردن بەمنالەکانی عەبد مەناف بسپێرن و پەردەداری و بەرێوەبردن و هەلگرتنی ئالاّ بەمنالەکانی عەبد الدار. پێکەوە ئاشتیان کرد و هەر دوو دەستە بەمە رازی بوون و دەستیان لەشەڕ کردن هەلگرت و هەرکام لەسەر پەیمانەکەی خۆیان پابەند بوون تا ئەوەی ئیسلام هات. لەم کاتەدا پێغەمبەر فەرمووی: هەرکەس لەرۆژگاری نەزانیدا( جاهلی) پەیمانی بەستووە، ئیسلام بەهێزتری کردووە بەلاّم لەئیسلامدا پەیمان نییە ( ریزبەندی خەڵکانی سەرزەمینێك لەبەرابەر یەك).

ئاو گەیاندن و پێدانی خواردن کەوتە دەست هاشم کوڕی عەبد مەناف چوونکە عەبد شەمس بەردەوام لەگەشت و گوزار و سامانی کەم و نانخۆری زۆری بوو. هاشم جوامێرێکی بەتوانا و بەخشەر بوو.

شیاو بوو ئەم داستانە پێش لەداستانی فیل سواران ئاماژەی پێبدەین. لەبەر ئەوە دوامان خست ئەو روداوانە پەیوستی یەك بوون وبەدوای یەك دەهاتن.

## کارەکانی خوسرەو ئەنەوشیروان لەبواری باج وەرگرتن و سوپاداری

پاشاکانی ئێران پێش خوسرەو ئەنوشیروان بەم شێوە باجیان لەخەڵك وەردەگرت کە لەسەر بنەمای ئاویاری و ئاوەدانی زەوییە کشتوکاڵییەکان لەبەشە جۆراوجۆرەکانی وڵات، یەك لەسەر سێ، یەك لەسەر چوار و یەك لەسەر پێنج و یەك لەسەر شەشیان وەردەگرت. گزیت (جەزیە)یەش ئەندازەکەی زانراو بوو. قوباد فەرمانیدا زەوییەکان بپێون و ئەندازەگیری بکەن تا باج وەرگرتن لەسەر بنەمایەکی راست بێت. ئەو پێش ئەوەی کۆتایی بەم کارە بێنێت، مرد. کاتێك ئەنەوشیروان بەپاشایەتی گەشت، کۆتایی بەو کارە هێنا و ئەندازە زانراوەکانی باج لەسەر گەنم، جۆ، ترێ، خورما، زەیتون و برنجی دانا. هەر جۆرێك ئەندازەیەکی باجی دیاریکراوی بوو. لەسێ جار یا بە سێ بەش وەریان دەگرت. ئەمانە ئەو بنەمایانە بوو عومەر کوڕی خەتاب بەکاری بەست. خوسرەو ئەنەوشیروان بۆ داوەری شارەکان نوسراوێکی لەپێرستی باجەکان نارد تا باج وەرگران هیچی پێ زیاد نەکەن. فەرمانیدا زیان بەدانەوێڵەی هەر کەسێك گەشت، بەئەندازەی زیانەکە لەباجەکەی کەم بکەنەوە. سەرانەیشیان لەسەر خەڵکان دانا بەڵام ئەم چینانەیان لەسەرانە بەخشی: گەورەکان،خاوەن بنەماڵە گەورەکان، ئەفسەران، سوپاییەکان، هیربودان، دەبیران، بەرێوبەرانی دەربار و موبدەکان. هەرکام لەخەڵك لەسەر بنەمای پێگەکەی لەدوانزە درەم، هەشت درەم، شەش درەم و چوار درەم. عومەر کوڕی خەتاب ئەم شیوەی بەکار بەست و تەنیا کارێ کەئەنجامی دا ئەوە بوو باجی سەرانەی لەکەمتر لەبیست ساڵ و زیاتر لەپەنجا ساڵ وەرنەدەگرت.

دواتر خوسرەو یەکێك لەدمبیرە دیارەکان لەگەورەکانی بەناوی بابەك بۆ ناونوسی سوپاکەی و پێدانی مانگانەی ئەوان دیاری کرد. ئەو داوای لەخوسرەو کرد هێزی زیاتر بکات و لەکارەکەیدا سەربەستی بکات. ئەو رۆشتە بینینی سوپا و لەوێ دانیشت. فەرمانیدا هەموو سوپا بەکەرەستەی شەڕو ئاژەڵەکانیان، هاتن و کاتێك ئەو خوسرەوی لەناویاندا نەبینی، فەرمانی گەرانەوەی دا. ئەم کارەی لە دوو رۆژدا دووبارە کردەوە و لەسێیەم رۆژدا فەرمانیدا جار بدەن: کەس لەماڵەوە دانەنیشێت

تەنانەت ئەگەر تاجی پاشایەتی لەسەردا بێت. خوسرەو ئەمەی بیست و جل و بەرگی شەڕی لەبەر کرد و تاجی خستە سەر و هات. ئەو هاتە لای بابەك تا بیبینێت. بابەك کەرەستەکانی شەڕی ئەوی بەتەواو زانی جگە لەدوو زرێ کەبۆ ئەویان دانابوو و کەڵکیان لێوردەگرت (تا لەکاتی تیرهاویشتن ئەگەر یەکیان بدرێت، یەکیان نەکەوێت). بابەك ئەو دووانەی بەخوسرەو نەبینی و نەینوسی و وتی: هەمووی ئەوەی پێویستە بیهێنە. خوسرەو کەوتە بیری دوو زرێکە و بەستی. جارچی بابەك جاریدا. بۆگەورەی شاسوار، سەرومەری بوێران، چوار هەزار درەم. بابەك ناوی خوسرەوی دیاری کرد. کاتێك لەشوێنەکەی خۆی هەستا هاتە لای خوسرەو و لەکردەوەی خۆی داوای لێخۆشبوونی کرد و بیری خستەوە هیچ کارێك بەبێ وردبینی و دور ئەندێشی ناکرێت. خوسرەو وتی: ئەوەی دەبێتە هۆی بەهێز کردن و ساماندانی پاشایەتییەکەمان، لای ئێمە ناپەسەند نییە.

لەوتەکانی خوسرەو ئەنەوشیروانی دادپەروەرە: سپاس کردن و بەخشینە خواییەکان هاوشێوەی دوو تای شایەنە. هەرکام قورستر بێت، سوکتر نیازمەندی دەبێت کەزیاد بکات و خۆی لەگەڵ هاوتاکەیدا بەرابەر بکات. کاتێك بەخشینی خوایی روی لەزیاد بوون کرد و سپاس کردن کەم، بەخشین کەم دەبێتەوە چوونکە بەخشین پێویستی بەسپاس کردنی زۆرە و هەرچی سوپاس کردن زۆرتر بێت، بەخشین زیاتر دەبێت و لێی تێدەپەرێت. من لەسپاس کردن وردبوومەوە و بە دوو شێوەم بینی: بەشێکی بەوتارە و بەشێکی بە کردار. وردبوومەوە تا بزانم خوا کام کارەی زیاتر لەهەمووان پێ خۆشتر و پەسەندترە. بینیم ئەومیە ئاسمانەکان و زەوی پێی سەقامگیر و کێوەکان خۆراگر و جۆگەکان سەررێژ و خەڵك خوازیارن پێی. ئەمە هەمان راستی و دادپەروەرییە. بەردەوام روم کردە ئەمە کارە و راستی و دادپەروەریم کردە پیشە. بینیم بەرهەمی راستی و دادپەروەری، ئاوەدانی وڵاتە کەسەقامگیری ژیانی خەڵك و ئاژەڵەکان و باڵندەکانی پێوەی بەستراوە. کاتێك لەم کارەدا نغرۆ بووم بینیم شەڕکەران، بەکرێگیراوانی ئاوەدان کردنەوە و بەکرێگیراوانی ئاوەدان کردنەوە، شەڕکەرانن. شەڕکەران کرێی خۆیان لەباجدەران و شارنشینان وەردەگرن چوونکە بەرگری کردن لەوان و شەڕکردنیان بەنوێنەرایەتی لەوان

لەئەستۆدایە. لەسەر ئاوەدان کەران و شارنشینانە کرێی ئەوان بێ کەم و کورِی بدەن چوونکە ئاوەدانی و ئاسایش و تەندروستی لەگیان ومالّ بێ ئەوان دەستەبەر نابێت. هەروەها بینیم بۆ شەرِکەران، خواردن و خواردنەوە و لەدایک بوونی منالّ و بەبەرهەم کردنی ژنان و بەدنیا هێنانی کوران و کچان بەبێ دانی باج وکاری ئاوەدان کەران ئامادە نابێت. لەبەر ئەمە لەباجدەران بۆ شەرِکەران بەو ئەندازەی نیازەکانی ئەوان وەلاّم بداتەوە، وەرمگرت و بۆ باجدەران، زەوی وکار و داهات و بار و بەرگیان بەو ئەندازەی کەئاوەدانی و بۆخەرجیەکانی ئەوان بەس بێت، دیاریم کرد و ستەمم لەهیچ کام نەکرد. من شەرِکەران و باجدەرانم وەك دوو چاوی بینا و هاوتای دوو دەستی بەتوانا و دوو پێی تیژپێ بینی لە بەهەرکام زیان بگات، ئەوی دیکەیش زیانی بەردەکەوێت.

ئێمە لەچۆنییەتی کاری پێشینانی خۆمان وردبووینەوە و هیچ کارێك لەکارەکانی ئەوان کەهۆکاری نزیك بوونەوە لەیەزدان و ناوی چاکە لای خەلّکان و باشتر بوونی سوپا و جەماوەر بێت، پشت گوێ نەخست و هەموویمان ئەنجام دا و خراپیەکانمان نەبینی مەگەر ئەوەی دەسبەرداری بووین و هاورێیەتی باوك و باپیران ئێمەی ناچار بەهاورێ بوون و دلّدادە بوونی هیچ شتێك نەکرد.

من لەچۆنیەتی کاری هیندییەکان و رۆمەکان وردبوومەوە و باشییەکانی ئەوانم هەلّبژارد. خواستەکانمان ئێمەی بەرەو خۆشیەکانمان رانەکێشا و هەمووی ئەمانەمان بۆ نوێنەران و هاوەلاّنمان لەولاّتانیتر نوسی.

ئێستا لەم وتانە وردببنەوە کەشایەتی بۆ فراوانی زانست و ئاوز و هێزی خۆپارێزی دەدات. کەسێك کەرۆژگاری بەم شێوە بێت، شیاوە تا رۆژی کۆتایی بیکەنە نمونەی دادپەروەری.

خوسرەو ئەنەوشیروانی دادپەرومر چەندین منالّی فرەزانی بۆ هاتە دنیا. ئەو پاشایەتی دوای خۆی بەکورەکەی هورموز بەخشی.

لەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلام لەسالّی فیل (عام الفیل) لەچل و دوەمین سالّی پاشایەتی خوسرەو بوو. لەم رۆژەدا شەرِی (زی جبلە) رویدا کە لەشەرِە ناودارەکانی عەرەبە.

## لە دایك بوونی پێغەمبەری خوا (٥٣ ك – ١١ ك/ ٥٧١/٦٣٢ ز)

قەیس کوڕی مەخرەمە و قساس (غیاس) کوڕی ئەشیم و عەبدوللە کوڕی عەباس دەڵێن: پێغەمبەری خوا لەساڵی فیل لەدایك بوو. کوڕی کەلبی دەڵێت: عەبدوللە کوڕی عەبد الموتەلیب باوکی پێغەمبەر لەبیست و چوارەمین ساڵی پاشایەتی خوسرەو ئەنەوشیروان لەدایك بوو و پێغەمبەر لەچل و دوەمین ساڵی فەرمانرەویەتی ئەو. خوا لەبیست و دوەمین ساڵی پاشایەتی خوسرەو پەرویز کوڕی خوسرەو هورموز کوڕی خوسرەو ئەنەوشیروان بۆ پێغەمبەری هەڵیبزارد و لەسی و دوەمین ساڵی پاشایەتی خوسرەو پەرویز لەمەککەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر ڕۆژی دوشەممە دوانزەهەمین شەو لەرەبیع الاول چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەدایك بوونی ئەو لەماڵێکی ناسراو بەناوی (ماڵی کوڕی سوف) رویدا. دەڵێن: دواتر پێغەمبەر ئەم ماڵەی بەخشی بەعەقیل کوڕی ئەبی تالب و ماڵەکە لەدەست ئەودا بوو تا مرد. کورەکەی بەمحەممەد کوڕی یوسف برای حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی فرۆشت. ئەو ماڵەکەی خۆی کەناسراو بەناوی (ماڵی کورەکەی یوسف) بوو، دروست کرد و ئەم ماڵەی تیا جێکردەوە تا ئەوەی خەیزەران (ژنی مەهدی و دایکی هادی و هارونی عەباسی) ئەوی جیاکردەوە و مزگەوتێکی دروست کرد. دەستەیەك دەڵێن: لەدایك بوونی پێغەمبەر لەدەیەم یا دوەمین شەوی ربیع الاول بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئامینە کچی وەهب دایکی پێغەمبەر دەیگێڕایەوە کاتێك سکی بەپێغەمبەر پڕبووە، کەسێك هاتۆتە خەوی و پێی وتووە: تۆ بە سەروەری ئەم خەڵکە سکت پڕە. کاتێك هێناتە دنیا بڵێ: ئەو لەزیانی هەر رژدیبەرێك بەخوای تاقانە دەسپێرم. دواتر ناوی بنێ محەممەد. کاتێك بەپێغەمبەر سکی پڕبوو، روناکییەکی درەوشاوە لەخۆیدا بینی کەتوانی کۆشکەکانی (بصری)ی لەشام پێببینێت. کاتێك هێنایە دنیا، باوەپیارەی عەبدالموتەلیبی ئاگادار کردەوە: کوڕێك بۆتۆ هاتۆتە دنیا، وەرە و لێی بروانە. عەبدالموتەلیب هات و ئەوی بینی و ئامینە

داستانی خەوەکەی خۆی گێرایەوە و وتی پێیان فەرمووە دەبێت چ ناوێکی لێ بنێن.

عوسمان کوڕی باوکی عاس دەڵێت: دایکم بۆی گێرامەوە کەئەو شایەتی لەدایک بوونی پێغەمبەر لەئامینە کچی وەهب بووە. وتی: هیچم لەماڵەکەدا نەبینی مەگەر ئەوەی روناك بوویەوە و من سەیری ئەستێرەکانم کرد بۆ پێشەوە غاریدان دەدا وەك بڵێی دەیانەوێت بێنە سەرزەوی.

یەکەم کەس شیری بەپێغەمبەر دا، سەوبیە کەنیزی ئەبولەهەب بوو. لەشیری کورکەی خۆی مەسروح شیری پێدا. پێشتر شیری بەحەمزە کوڕی عەبدالموتەلیب دابوو و دوای ئەو باوکی سەلمە کوڕی عەبد ئەلئەسەدی مەخزومی شیردا. سەوبیە پێش کۆچی پێغەمبەر لەمەککە دەهاتە لای و پێغەمبەر و خەدیجە رێزیان لێدەگرت. خەدیجە کەسی بۆ لای باوکی لەهەب نارد تا سەوبیە بکرێت و ئازادی بکات، بەڵام باوکی لەهەب رازی نەبوو. کاتێك پێغەمبەر بۆ مەدینە کۆچی کرد، باوکی لەهەب ئازادی کرد و لەم کاتەدا پێغەمبەر دیاری دەنارد تا بیستی سەوبیە لەگەڕانەوە لەخەیبەر گیانی داوە. لەکورەکەی مەسروحی پرسی، وتیان: پێش دایکی مردووە. پرسی: ئایا هیچ کەس وکار یا خزمێکی هەیە؟ وتیان: لەو کەس بەجێ نەماوە.

دوای سەوبیە، حەلیمە کچی باوکی زوەیب عەبدوللە کوڕی حارس کوڕی شێجنە لەمناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر کوڕی هوازن، شیری بەپێغەمبەردا. ناوی هاوسەرەکەی کەپێغەمەری لەشیری ئەو تێردەکرد، عەبدالعوزەی و ناوی هاوشیرەکانی عەبدوللە و ئەنیسە و جوزامە (شەیما )بوو. ئەم کچە بەناوی شەیما ناوی دەرکرد. ئەو لەپەرستاری پێغەمبەر هاوکاری دایکی دەکرد.

کاتێك پێغەمبەر خەدیجەی بەهاوسەری هەڵبژارد، حەلیمە هاتەلای و پێغەمبەر رێزی لێگرت و دیاری زۆری پێبەخشی. ئەو پێش گرتنی مەککە بەدەست پێغەمبەر چاوی لەدنیا بەست. کاتێك مەککە لەلایەن موسوڵمانانەوە دەستی بەسەرداگیرا، خوشکەکەی هاتە لای پێغەمبەر و پێغەمبەر هەواڵی حەلیمەی پرسی و ئەو وتی مردووە. چاوەکانی پێغەمبەر فرمێسکی تێزا. پێغەمبەر پرسیاری بەجێماوەکانی حەلیمەی کرد و ژن پێی ناساند. ئەو داوای بەخششی لەپێغەمبەر کرد و پێغەمبەر

نیازەکەی بەراوەردە کرد.

عەبدوللە کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب دەڵێت: حەلیمەی سەعدی دەیگێڕایەوە: لەشارەکەی خۆم هاورێ لەگەڵ ئەو ژنانە هاتمەدەر کەهەموویان بەدوای منالی شیرخۆردا دەگەران. وشکەسالی بوو و هیچمان بۆ نەمابوویەوە. من سوار مێچکە کەرێکی سپی بووم و ئێمە مێچکە وشترێکی پیرمان هەبوو کەیەك دڵۆپ شیری تیا نەبوو. سەراسەری شەو لەگریانی منالەکەم (لەتاو برسیەتی)نەخەوتم. مەمکم ئەوەندی شیر تیا نەبوو برسیەتییەکەی بشکێنێت. وشترە پیرە مێچکەکەیش بەهەمان شێوە. بەڵام ئێمە هیواداربووین. مێچکەکەرەکەی من لەبەرناتەوانی و لاغری ببووە هۆی ئازاردانی کاروانەکە. هاتنیە مەککە و پێغەمبەریان بردە لای یەك یەکی ژنەکان و هیچ کام رازی نەبوون چوونکە وتیان ئەو باوك مردووە. ئەمە لەبەر ئەوەبوو چوونکە ئێمە چاوەروانی پاداشت لەباوکی منالەکە بووین. دەمانوت: باوکی مردووە، دایك و باوەپیارەی دەتوانن چیمان بۆ بکەن؟ هەر ژنێك منالێکی هەلگرت جگە لەمن کەکەسم دەستنەکەوت. کاتێك ویستمان بگەرێینەوە بەهاوسەرەکەم وت( ئەو لەگەڵ من بوو): بە باشی نازانم بێ منال بگەرێمەوە چوونکە شەرم لەهاورێکانی خۆم دەکەم کە نەمتوانیبێت منالێك پەیا بکەم. سوێند بەخوا دەرۆمە مالی ئەو کورە باوك مردووە و هەلێدەگرم. هاوسەرەکەم وتی: ئەم کارە بکە، ئەگەری هەیە خوا لەپاداشتی ئەم کارە بەرەکەتێکمان پێ ببەخشێت. رۆشتم و هەڵمگرت. کاتێك هەڵمگرت و خستمە سەر داوێنم، هەر دومەمکەکەم شیریان بۆ دەباراند، بەشێوەیەك هەرچەندەی دەویست، خواردی. ئەو خواردی و تێربوو و براکەی خواردی و تێر و هەردووکیان خەوتن. کورەکەم پێشتر خەوی لێنەدەکەوت. هاوسەرەکەم رۆشتە لای پیرە وشترەکەمان و بینی گوانەکانی پڕ شیرە. لێی دۆشی و خواردی تا تێر بوو و دەرخواردی منی دا و خواردم و تێربووم. دەڵێت: هاوسەرەکەم بەمنی وت: دەزانی حەلیمە، سوێند بەخوا منالێکی پیرۆزت هەلگرتۆتەوە. وتم: سوێند بەخوا ئەو هیوام هەیە. دەڵێت: دواتر هاتینەدەر و سوار مێچکە کەرەکە بووم و منالەکەم سوار کرد. لەم کاتەدا کەر بەغاردان دەرۆشت و هیچ یەك لەکەرانی ئەوان نەیتوانی بەمن بگاتەوە بەشێوەیەك ژنانی هاورێم وتیان:

کچی باوکی زوەیب، کەمێك چاوەڕێمان بکە، مەگەر ئەمە هەمان کەر نییە پێی هاتی؟ وتم: سوێند بەخوا ئەوە. ژنان دەیانوت: بۆتە کەرێکیتر، شتێك لەئارادا هەیە. دواتر گەراینەوە بۆ ماڵەکانمان لەناو منالەکانی سەعد کەهیچ زەوییەك لە زەوییەکانی خوامان بەوشکتر لەو نەدەزانی. لەوە بەدوا مەر و بزنەکانم بەگوانی پڕ شیر و تێر ئێواران دەگەرانەوە و ئێمە دەماندۆشین و دەمانخوارد و کەسانیتر یەك دڵۆپیان لەگوانەکانیان نەدەبینی. کار گەشتە ئەوەی بینەرێك لەخەڵکانی خۆمان وتی: هاوار لەئێوە، لەوێ مەرەکانتان بلەوەرێنن کەکچی باوکی زوەیب دەیلەوەرێنێت. بەڵام مەرەکانی ئەوان برسی دەگەرانەوە و بێ شیر و ئەوانەی من تێر و پڕشیر.

ئێمە بەردەوام لەخوا بەرەکەت و باشی زیاترمان دەبینی تا دوو ساڵ تێپەری و من ئەوم لەشیر گرتەوە. ئەو بەشێوەیەك گەشەی دەکرد، منالانیتر پێینەدەگەشتن. هێشتا دوو ساڵ لەتەمەنی تێپەری نەکردبوو، ببووە کوڕیکی بەهێز. ئەومان بۆ دایکی گەراندەوە بەڵام زۆرترین تکا و داوامان کرد تا لای ئێمە بمێنێتەوە چوونکە بەرەکەتی فراوانمان لێ بینیبوو. لەگەڵ دایکی سەبارەت بەمانەوەی لای ئێمە دواین و ئەو رازی بوو. دەڵێن: ئەومان گەراندەوە. سوێند بەخوا هێشتا چەند مانگ لەگەرانەوەی تێپەری نەکردبوو کەهاورێ لەگەڵ براکەی لەگەڵ مەروماڵاتەکەمان دەرۆشتە دەشتی پشت ماڵمان. لەناکاو براکەی هات و بەمن و باوکی وت: ئەو کورە قورەیشیە! دوو پیاوی جل سپی هاتن و سکیان هەڵدری و دڵیان بەدەست ژێرورووە کرد. دەڵێت: ئێمە بەپەلە و راکردن رۆشتین و بینیمان راوەستاوە و روخساری سور هەڵگەراوە. دەڵێت: من و باوکی باوەشمان پیا کرد و وتمان: کورم، چیت بەسەر هاتووە؟ وتی: دوو پیاو هاتن و سکیان دریم و لەسینەمدا بەدوای شتێك گەران کەنەمزانی چییە. دەڵێت: گەراینەوە بۆ خێوەتەکانمان و باوکی بەمنی وت: سوێند بەخوا دەترسم زیانێك بەم منالە گەشتبێت. پێش ئەوەی نەخۆشییەکەی دەرکەوێت، بیبەرەوە بۆ لای کەسەکانی.

دەڵێت: هەڵمانگرت و بردمانە لای دایکی. ئامینەی دایکی وتی: ئەی دایکی، بۆ هێناتەوە؟ تۆ زۆرت هەوڵ دەدا لای ئێوە بێت. وتم: خوا کورەکەمی گەورە کرد و من

کاری خۆم تەواو کرد، ئێستا دەترسم شتێکی بەسەر بێت. لەبەر ئەمە ئەوم بەو تەندوروستییەی ئارەزومەندی پێی، بۆ تۆ گەراندەوە. ئامینە وتی: ئەمە کاری تۆنییە، راستی بەمن بڵێ. دەستی لێ هەڵنەگرتم تا داستانی دوو پیاوی سپی پۆشم بۆ گێرایەوە. ئامینە وتی: ترسایت جنۆکە دەستی لێبووەشێنێت؟ وتم: بەڵێ. ئامینە وتی: کاتێك دووگیان بووم، لەخەودا بینیم رووناکییەك لەمن هاتەدەر کەهەموو کۆشکەکانی بصری م بینی و روناکی کردەوە. ئەوسا لەسکدا هەڵمگرت و سوێند بەخوا هیچ منالێکم نەبینیوە لە سکدا وەك ئەو سوك و ئاسان بێت. کاتێك ئەوم هێنایە دنیا، بەدەست کەوتە سەر زەوی و ئەوسا سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. ئەو لای من دابنێ و بەسلامەتی بگەرێرەوە.

رۆژگاری شیرخواردنی پێغەمبەر دوو ساڵی خایاند. حەلیمە – بەوتەی هەندێ کەس- لەپێنج ساڵیدا ئەوی بۆ لای دایکی و باوەگەورێی، عەبدالموتەلیب گەراندەوە.

شەداد کوڕی ئەوەس دەڵێت: رۆژێك لای پێغەمبەر بووین، پیرەپیاوێك لەمناڵەکانی عامر هات و ئەو پاشا و سەروەری خەڵکەکەی خۆی و بەتەواوی پیر و بەتەمەن بوو. پاڵی بەداردەستەکەیەوە دا و لەبەرابەر پێغەمبەر دا وەستا، وتی: ئەی کوڕی عەبد الموتەلیب، پێیان وتم گومان دەکەیت پێغەمبەریت و خوا تۆی بەهەمان ئایین نارد کەئیبراهیم و موسی و عیسای رەوانە کرد. بزانە وتەیەکی گەورەت هێناوەتە سەرزمان. پێغەمبەرانی پێش تۆ لەمناڵەکانی ئیسرائیل بوون و تۆ ئەم بت و بەردانە دەپەرەستی. تۆ و پێغەمبەری! هەر وتەیەك ناوك و گەوهەرێکی هەیە. ناوك و گەوهەری وتەکەی تۆ چییە؟

پێغەمبەر لەپرسیاریەکەی سەری سورما و پێی خۆش بوو. دواتر فەرمووی: ئەی برایەك کە لەمناڵەکانی عامری، دانیشە. ئەو دانیشت. پێغەمبەر پێی وت: گەوهەر و ناوکی وتاری من ئەوەیە کە هەمان ناوبراوی ئیبراهیم و هەمان مژدەی عیسام. من یەکەم منالی دایکم بووم و لەهەمووی منالەکانیتر گرانتر هەڵیگرت. ئەوسا لەخەودا بینی، ئەوەی لەسکیدایە، روناکییە. دایکم دەیوت: چاوەکانی من بەدوای روناکی دەرۆشت و روناکی لەچاوەکانم پێش کەوت تا رۆژهەلات و رۆژئاوای بۆ روناك کردمەوە. منی هێنایە دنیا، گەورە بووم و گەشەم کرد. منیان بۆ شیر خواردن

بەمناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر سپارد. ڕۆژێك لەگەڵ کورانی هاوتەمەنی خۆم لەماڵ دوورکەوتمەوە، لەناکاو سییان بە مشتی زێرین و پڕ لەسەهۆڵ هاتن و منیان لەناو هاورێکانم هەڵگرت. هاورێکانم رایانکرد تا گەشتنە لێواری دۆڵ و ئەوسا رویان کردە ئەو سییانە و وتیان: چیتان لەم مناڵە دەوێت؟ ئەو باوکی نییە و ئەگەر بیکوژن کەس بۆ تۆڵە سەندنەوە دواتان ناکەوێت. کاتێك کورەکان بینیان ئەو سییانە وەلاّم نادەنەوە، بەراکردن رویان لە دێ کرد و ڤیژاندیان و خەڵکیان بۆ هاوکاری کردنی من لەبەرابەر ئەو سییانە ئاگادار کردەوە. یەك لەو سییانە هات و بەنەرمی منی لەسەر زەوی خەواند و ئەو سات سینەمی تا لای ناوکم بڕی. سەیرم دەکرد و هەستم بە ئازار نەدەکرد. ئەو ناو سینە و سکی منی دەرهێنا و بە سەهۆڵ شۆردی و بەجوانی پاکی کردەوە. دواتر دڵی دەرهێنام و قەڵشتی و پەڵەخوێنێکی رەشی لێدەرهێنا و فڕیدا. ئەو دەستی تیا دەگەراند وەك بڵێی بەدوای شتێکدا دەگەرا. لەناکاو بینیم ئەنگوستیلەیەك لەروناکی لەدەستیدا بوو کەچاوی بینەرانی زەق دەکرد. ئەو دڵمی بەو خۆشەویستییە ژێرو روو و دڵمی لەروناکی لیپاولیپ کرد. ئەمە هەمان روناکی پێغەمبەری و فرەزانی بوو. دواتر دڵمی خستە شوێنی خۆی. ساردی ئەنگوستیلەکەی ئەوم تا رۆژگارێکی درێژ هەست پێدەکرد. سێیەمین بەهاوەڵەکەی وت: برۆ ئەولا. ئەو رۆشتە دواوە. ئەو دستی بەسەر سینەی من تا لای ناوکم هێنا و ئەو قەڵشتە گەورە بەفەرمانی خوا یەکی گرتەوە. دواتر دەستی منی گرت و بەرزی کردمەوە و بەنەرمی لەسەر پێ رایگرتم. ئەوسا بەیەکەم کەس کەسکی منی هەڵدریبوو، وتی: ئەو لەگەڵ دە کەس لەئۆمەتەکەی هاوسەنگ بکە. ئەو کارەیان کرد و من سەنگینتر بووم. وتی: ئەو لەگەڵ سەد کەس لەئۆمەتەکەی هەڵسەنگێنە. هەڵیسەنگاند و من پێش کەوتم. وتی: ئەو لەگەڵ هەزار کەس لەئۆمەتەکەی بخەرە ناو تای شایەن. منیان لەبەرابەر هەزار کەس خستە تای شایەن و من قورستر بووم. وتی: وازی لێبێنن. ئەگەر ئەو لەگەڵ هەموو ئۆمەتەکەی هاوسەنگ بکەن، ئەو سەنگینتر دەبێت. دواتر منیان بەسنگیانەوە نوساند و سەر و ناوچاویان ماچ کردم، وتیان: ئەی هاورێ! ئارام بە، ئەگەر بزانی چ باشییەکیان بۆ تۆ لەبەرچاو گرتووە، چاوەکانت روناك دەبن.

دەڵێت: لەمەدا بووین کە لەناکاو هەمووخەڵکانی دێ بەراکردن هاتن و دایکیشم(ئەوەی شیری پێدەدام) لەپێشیانەوە، بەبەرزترین دەنگ دەیقیژاند. بەردەوام دەیوت، ئەی هاوار لەکورە ناتەوانەکەم! ئەوان هاتنە لای من و سەر و روخساریان ماچ کردم و وتیان: خۆش بەحاڵی تۆ کە کوڕیکی ناتەوانیت! دواتر دایکی شیردەرم وتی: ئەی هاوار، کورە تەنیاکەم! ئەو سیبانە هاتنە لای من و منیان بەسینەیانەوە نوساند و ماچیان کرد، وتیان خۆزگەمان بەتۆ کەتەنیا نیت. خوا لەگەڵ تۆیە. دوبارە دایکی شیردەرم وتی: لەناو هاوتەمەنەکانت تۆیان بەناتەوان بینی و لەروی ناتەوانییەوە ئازاریان دایت. ئەوان هاتنە لای من، منیان بەسینەوە نوساند، ماچیان کرد و وتیان: خۆزگەمان بەتۆ ئەی کوڕی باوك مردوو! چوونکە رێزدارترین کوڕی لای خوا. ئەگەر بزانی چ باشییەکان چاوەڕێتن! دەڵێت: دواتر منیان هێنایە لێواری دۆڵەکە و کاتێك دایکی شیردرەرم منی بینی، وتی: کورەکەم، ئەمە تۆیت بەزیندووی دەتبینم! هات و منی لەئامێز گرت. سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەست ئەودایە، لە داوێنی ئەودابووم و ئەو منی بەخۆیەوە دەگوشی کەبینیم دەستم لەناو دەستی یەك لەواندایە. سەیری هەر سێکیانم دەکرد و گومانم دەکرد خەڵك ئەوان دەبینن. دەستەیەك لەخەڵك دەیانوت: ئەم کورە لەپەری یا دێوەکان زیانی بەرکەوتووە. بیبەنە لای کاهینی دێ تا لێی بروانێت و دەرمانی کات. وتم: ئەم هاوار هاوارە بۆچییە؟ من زیانم بەرنەکەوتووە. بیر و هزرم تەواو، دڵم ئارامە و هەست بەرەنج و ئازار ناکەم. باوکی شیردەرم وتی: نابین وتاری؟ هیوادارم زیان بەرکورەکەم نەکەوتبێت. دوبارە هاودەست و هاورا بوون من ببەنە لای کاهین. منیان بردە لای. کاتێك داستانی منیان بۆ گێرایەوە، وتی: بێدەنگ بن تا لەزمانی کورەکە خۆی بیبیستم چوونکە من لەکاری ئەو شارەزاترم. من لەسەرتاوە تا کۆتاییم بۆ گێرایەوە. کاتێك قسەکەی منی بیست، لەئامێزی گرتم و دواتر بەبەرزترن دەنگ وتی: ئەی عەرەبەکان، ئەم کورە بکوژن و خوێنی من لەگەڵ ئەودا برێژن! سوێند بە لات و عزی ئەگەر ئەو لەسەر کارەکەی خۆی ئازاد بکەن، بێ گومان پشت دەکاتە دینەکەی ئێوە و ناسازگاری لەگەڵ ئێوە دەگرێتەبەر و ئایینێك دێنێت هاوتاکەیتان نەبینیبێت.

دایکی شیردەرم منی لەئامێزی دەرهێنا و وتی: تۆ نەخۆش و شێتی نەکورکەی من. بۆخۆت بۆ کەسێك بگەرێ تا بتکوژێت. من کوری خۆم ناکوژم.

دواتر منیان بۆ کەس و کاری خۆم گەراندەوە و لەوەی بینیبووم، بەترسەوە دەژیام و شوێنی قەڵشتەکە هاوشێوەی رشتەیەك لە سینەوە تا ژێر دڵم دیار بوو. ئەمە ناوك و گەوهەری وتاری من و سەرەتای کاری منە ئەی برام لەمناڵەکانی عامر.

پیرەپیاوی عامری وتی: خوایەك کەجگە لەو خوایەك نییە، بەشایەت دەگرم کەوتار و کرداری تۆ راستە و دروست. چەند پرسیارێکم هەیە وەڵام بدەرەوە. پێغەمبەر فەرمووی: بپرسە. پیرەپیاو وتی: زانست چی زیادی دەکات؟ پێغەمبەر فەرمووی، فێرکردن و راهێنان. پیرەپیاو پرسی: چ شتێك دەبێت هۆکاری زۆربوون لەهەر شتێك؟ پێغەمبەر فەرمووی: پێداگرتن. پیرەپیاو پرسی: ئایا چاکەکاری لەپاڵ ئەنجامدانی کاری قێزەون ئەنجامی دەبێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، گەرانەوە بۆ لای خوا گوناح دەسرێتەوە و چاکەکان خراپەکان لەناو دەبەن و کاتێك بەندەیەك لەکاتی خۆشیدا لەخوا بپارێتەوە، خواوەندی لەکاتی گرفتاریدا دەست دەکەوێت. پیرەپیاوی عامری پرسی: بەچ شێوەیەك؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەشێوەیەك کەخوای گەورە دەفەرمێت: سوێند بەمەزنی و گەورەیم بۆ بەندەکەم دوو ئارامی ئامادە ناکەم و ئەو بەدوو ترس ئازار نادەم. ئەگەر لەم دنیا لەمن بترسێت، رۆژێك کەبەندەکانم لەبارەگای پیرۆز کۆدەکەمەوە، ئارامی پێ دەبەخشم و لەگەڵ ئەوانەی سەرکوتیان دەکەم، سەرکوتی ناکەم. بەڵام ئەگەر لەم دنیا لەمن بەئارامی ژیا، رۆژێك کەبەندەکانم لەو شوێنەی مژدەم پێداوە، کۆدەکەمەوە، ترسم بەسەر ئەودا زاڵ دەبێت و ئارامی لێ دەبرێت.

پیرەپیاو وتی: ئەی کوری عەبد الموتەلیب، پێشنیاری چی دەکەیت؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەپەرەستینی خوایەك کەشەریکی نییە، بەوەی هاوتاکانی خوا لەناوبەریت و باوەر بەلات و عزی لە دڵ دەرکەیت و بەوەی پێغەمبەر و نوسراو لەلایەن خواوە هێناویەتی، باوەر بێنیت و نوێژ لەکاتی خۆیدا بخوێنیت ویەك مانگ لەساڵ بەرۆژ بیت و زیادی سامان خۆت لەرێگای خوا خەرج بکەیت تا خوا

گوناحەکانی تۆبسرێتەوە و ئەگەر بتوانیت برۆیتە ماڵی خوا بۆ حەج و ئەگەر لەگەڵ ژن جوت بوویت، سەر و جەستە بشۆیت و باوەر بەمەرگ و ژیانی دوای مەرگ و بەهەشت و جەهەننەم بێنیت. پیرەپیاو وتی: ئەی کوڕی عەبدوئەلموتەلیب، ئەگەر ئەو کارە بکەم، چیم دەست دەکەوێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەهەشت کە لەژێریدا روبارەکان ڕەوانن و ئەمە پاداشتی کەسێکە دڵ و گیانی پاك بکاتەوە (طة/ ٢٠/٧٦).

پیرەپیاو وتی: لەگەڵ ئەمانە لەم دنیا چی هەیە؟ من ژیانی باش و خۆشم خۆشدەوێت. پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، هاوکاری و هاویاری لەشارەکان. ئەو رازی بوو و باوەری بەپێغەمبەر هێنا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عەبدوللە کوڕی عەبد ئەلموتەلیب باوکی پێغەمبەر مرد و دایکی پێغەمبەر ئامینە کچی وەهب کوڕی عەبد مەناف کوڕی زوهەر سکی بەپێغەمبەر پڕبوو.

هشام کوڕی محەممەد دەڵێت: عەبدوللە باوکی پێغەمبەر مرد و ئەو لەم کاتەدا بیست ساڵ و هەشت رۆژ یا یەك ساڵ تەمەنی بوو.

واقدی دەڵێت: ئەوەی لای ئێمە راستە ئەوەیە عەبدوللە کوڕی ئەلموتەلیب هاورێ لەگەڵ کاروانێك لەقورەیش لەشامەوە بۆ مەدینە هات و لەوێ لەکاتێکدا نەخۆش بوو، مایەوە تا چاوی لەدنیا بەست و ئەویان لەماڵی نابغە(ماڵی گەورە) بەخاك سپارد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دایکی، ئامینە لە(ابوا ) لەنێوان مەککە و مەدینە گیانیدا و پێغەمبەر شەش ساڵان بوو. ئەوی بۆ لای خاڵۆکانی لەمناڵەکانی نەجار هێنابوو تا یەك ببینن. ئەو لەگەڕانەوە چاوی لەدنیا بەست. دەستەیەك دەڵێن: ئامینە هاتە مەدینە تا سەردانی ئارامگای هاوسەرەکەی خۆی عەبدوللە بکات و پێغەمبەر و پەرەستارەکەی دایکی ئەیمەن لەگەڵیدا بوون و کاتی گەڕانەوە لە ئەبوا چاوی لەدنیا بەست. دەستەیەك دەڵێن: عەبد ئەلموتەلیب هاتە سەردانی خاڵۆکانی لەمناڵەکانی نەجار و پێغەمبەر هاورێ بوو. لەکاتی گەڕانەوە ئامینە مرد و لەدۆڵی ئەبوزەر بەخاك سپێردرا. وتاری یەکەم راسترە.

کاتێك قورەیشیەکان ڕۆشتنە شەڕی ئوحود، ویستیان پەیکەری ئامینە دەربێنن، بەلآم کەسێك لەناویان وتی: ژنان ژێردەستن و محەممەد دەتوانێت زیان بەژنەکانی ئێوە بگەیەنێت. خوا بۆ ڕێزلێنان لەدایکی پێغەمبەر ئەوانی لەم کارە دور خستەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عەبدالموتەلیب لەهەشت ساڵی یا دە ساڵی پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد و کاتێك مرد، لەسەر داوای ئەو، سەرپەرەستی پێغەمبەر بەمامەکەی ئەبوتالب گەشت. ئەو لای ئەو پەروەردە و گەورە بوو. ئەمە لەبەر ئەوە بوو عەبد الموتەلیب خۆشەویستی ئەبوتالبی بۆ پێغەمبەر دەبینی.

## کوژرانی تەمیمیان لەمەشقەر

هشام دەڵێت: وەهرمز کاڵا بێ وێنە و سامانە فراوانەکانی لەیەمەن بۆ خوسرەو نارد. کاتێك کاروانەکان بەسەرزەمینی منداڵەکانی تەمیم گەشت، سەعسەعە کوڕی ناجیە موجاشەعی باوەگەورێی فەرمزدەق وتاردەری ئەوان، ئەوانی بۆ هێرش کردنە سەر کاروان هاندا. ئەوان رازی نەبوون. سەعسەعە وتی: دەبینم کوڕانی بەکر کوڕی وایل ئەم کاروانە تاڵان دەکەن و بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە کەڵکی لێوەردەگرن. کاتێك ئەمەیان بیست، هێرشیان کردە سەر کاروانەکە و تاڵانیان کرد. پیاوێك لەمناڵەکانی سەلیت کەپێیان دەوت نەتیف، تورەکەیەکی پڕ زێڕی دەسکەوت. لەوسەردەمەوە بووە پەندی پێشینان کەدەیانوت: فلان گەنجی نەتیفی دۆزییەوە. کاروانیان بەرێکەوتن تا گەشتنە لای هوزە کوڕی عەلی حەنەفی لەیەمامە. ئەو ئەوانی داشارد و لەگەڵ خۆی بردنیە لای خوسرەو. خوسرەو ئەم کارەی پێ خۆش بوو و فەرمانیدا رشتەیەکیان لەگەوهەر هێنا و لەدەوری سەریان بەست و لەو کاتەوە بە(هوزەی تاجدار) ناویان دەبرد.خوسرەو پرسیاری مناڵەکانی تەمیمی لێکردن کەئایا لەخەڵکی ئەون یا پەیمانی ئاشتیان لەنێواندایە. هوزە وتی: لەنێوان ئێمە جگە لەمردن هیچ نییە. خوسرەو وتی: بەمەبەستەکەی خۆت دەگەیت. پاشای ئێران ویستی سوپا بکاتە سەر تەمیمەکان بەڵام پێی وترا، ئاویان کەمە و سەرزەمینەکەیان شوم. پێشنیاریان پێکرد ئەم کارە بەنوێنەری خۆی لەبەحرەین بسپێرێت. ئەو ئازاد فیروز کوڕی جوشەیش بوو کەعەرەبەکان بە(جیاکەرەوە بەشمشێر) بانگیان دەکرد چوونکە دەست و پێی خەڵکانی دەبڕی. فەرمانی کوشتنی تەمیمیەکانی پێدا و ئەم کارەی کرد. خوسرەو نێردراوێکی بۆ لای ئەو نارد و هوزەی بانگ کرد و جارێکیتر رێزی لێگرت و خەڵاتی کرد و فەرمانیدا لەگەڵ نێردراوەکەی بڕواتە لای ئازاد فیروز. ئەو دووانە لەکاتی کۆکردنەوەی دانەوێڵە گەشتنە لای ئەو و تەمیمیەکان بۆ کۆکردنەوە و بەدەست هێنانی خواردن هاتبوونە (هیجر). ئازاد

فیروز فەرمانی بەجارچییەکدا جاربدات: هەموو تەمیمیەکان لێرەدا کۆببنەوە کەپاشا فەرمانی خواردن و توێشو دانی ئەوانی دەرکردووە. تەمیمیەکان هاتنە و رۆشتنە ناو مەشقەر کەناوی قەلآیەکە. کاتێك رۆشتنە ناو قەلآ، ئازاد فیروز پیاوەکانی ئەوانی کوشت و کورەکانی راگرت. لەم رۆژەدا سوارکاری قەعنەبی ریاحی سوارکاری یەربوع کوژرا. ئازاد فیروز کورەکانی سواری کەشتی کرد و لە رێگەی کەنداوی فارسەوە رەوانە ئێرانی کردن.

هوبەیرە کوڕی حودەیرەی عودەی دەڵێت: دوای داگیر کردنی ئیستەخر، ژمارەیەك لەتەمیمیەکان بۆ لای ئێمە گەرانەوە. پیاوێك لەتەمیم بەناوی عوبەید کوڕی وەهبیان بەزنجیری درگاوە بەستبوو، زنجیرەکەی پچراند و هەڵات. هوزە داوای سەد ئەسیری لەئازاد فیروز کرد کە پێی بەخشرا و ئەوانی ئازاد کرد.

## پاشایەتی هورموز کوڕی ئەنەوشیروان

دایکی کچی خاقانی گەورە بوو. هورموز کوڕی خوسرەو پیاوێکی فرمزان، خاوەن فەرهەنگ و خوازیاری چاکەکاری لەگەڵ نەداران و زەخت کردن لەستەمکاران بوو. ئەمانە لێی رەنجان و بوونە دوژمنی. لەدڵی ئەویشدا بێزاری و دوژمنایەتی ئەوان رەگی داکوتا. پیاوێکی دادپەروەر بوو. لە دادپەروەریدا گەشتە ئاستێك کەرۆژێك سواربوو و بەرەو سابتی مەداین رۆشت. لەرێگا لەناو رەزەکان تێپەری کرد. یەکێك لە وارە تایبەتەکانی ئەو لەسەر دیوارەوە رۆشتە ناو رەزەکان و چەند بۆڵێك تریی لێکردەوە. پاسەوانی رەز ئەوی بینی و هاواری کرد. سوار بەرادەیەك لەهورموز ترسا کە بەپاسەوانەکە کەمەربەندێکی زێرینی لەجیاتی چەند بۆڵە ترێکەدا تا دەستی لێهەڵگرت.

دەڵێن: ئەو پیاوێکی بەختەوەر و کامەران بوو. دەستی بۆ شتێك درێژ نەدەکرد مەگەر ئەوەی بەدەستی دەهێنا. پیاوێکی وشیار بەڵام رەشبین بوو کەزیاتر پشتی بە خاڵۆ تورکەکانی خۆی دەبەست. ئەو لەزاناکان(دین پیشەکان) و خاوەن بنەماڵە گەورەکان و سامان زۆرەکان سیانزە هەزار و شەسەد کەسی کوشت. ئەو جگە لەدڵدانەوەی هەژاران و نەداران بیری لەهیچیتر نەدەکردەوە. زۆربەی گەورەکانی خستە زیندانەوە و پێگەی ئەوانی دابەزاند و سوپای بێ داهات کرد. لەبەر ئەمە زۆربەی کەسانی دەوروبەری لێی دوور کەوتنەوە و شایە، پاشای تورکان لەگەڵ سێسەد هەزار پیاوی شەرکەر لەشانزەهەمین ساڵی پاشایەتی ئەو هێرشی کردەسەر و تاهەرات و بادغیس هاتە پێش و پەیامی بۆ هورموز و ئێرانییەکان نارد و فەرمانیدا رێگاکان تەخت و سەر لەنوێ دروستیان بکەنەوە تا ئەو هێرش بکاتە سەر سەرزەمینی رۆم. پاشای رۆم لەگەڵ هەشتا هەزار پیاوی شەرکەر بۆ روبەروبوونەوەی ئەو رویکردە سنورەکان. پاشای خزەر لەگەڵ سوپایەکی گەورە گەشتە دەروازەی دەروازەکان (دەربەندی ئێستا). لەم کاتەدا ژمارەیەك لەعەرەبەکان هێرشیان کردە سەر سواد و تالآنیان کرد. هورموز بەهرامی چوبینی لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەری

هەڵبژێردراو لەسوپاکەی خۆی نارد و ئەو سەرسەختانە بۆ پێشەوە رۆشت و روبەروی پاشای تورك بوویەوە و بەیەك تیر لەپێی خست و بەرەو لەناوچونی برد و سوپای تورك بەمە هەموو شتێکی خۆی دۆراند. دواتر برمدە کوڕی شایە روبەروی بوویەوە کەبەهرام ئەویشی تێکشکاند و ئەوی لەیەکێك لەقەڵاکان زیندانی کرد تا لەبەرابەر بەهرام چۆکی دادا و خۆی تەسلیم کرد. بەهرام بەدیلی ڕەوانەی بارەگای هورموزی کرد و سامانەکانی قەڵاکەی تاڵان کرد. سامانەکان زیاد لەرادە فراوان بوون.

دواتر بەهرام و هاورێکانی لەهورمز ترسان و ئەویان لەسەر کار لابرد و بەرەو مەداین رۆشتن و جاریاندا کەکورەکەی پەرویز بۆ پاشایەتی شیاوترە. دەستەیەك لەدەربارییانی هورموز یارمەتی ئەوانیاندا. مەبەستی بەهرام ئەوەبوو هورمز لەکورەکەی پەرویز و ئەو لەم دوور بکاتەوە. ئەگەر پەرویز سەرکەوێت، کاری بەهرام ئاسان دەبێت و ئەگەر باوکی سەرکەوێت، بەهرام رزگاری دەبێت چوونکە دەبینێت لەنێوان باوك و کور دژایەتی هەیە و ئەو ژەهری خۆی بەهورموز دەرێژێت چوونکە ئەو (بەهرام) لە دڵدا ئەندێشەی بەدەست هێنانی تاجی شایی دەپەرورمراند.

کاتێك پەرویز لەم کارە ئاگادار بوویەوە، لەباوك ترسا و بەرەو ئازەربایەجان رایکرد و ژمارەیەك لەسنورداران و سوپاسالاران گرتیان. گەورەکانی مەداین و لەناو ئەوان (بەندویە) لەگەڵ بەستام خاڵۆی پەرویز کۆبوونەوە و هورموزیان لەسەر کارلابرد و چاوەکانیان کوێر کرد و چوونکە بەکوشتنی شادمان نەبوون، ئەویان لەو حاڵەدا هێشتەوە. ئەم هەواڵە بەپەرویز گەشت و مەبەستی گەڕانەوە بۆ پایتەختی کرد.

رۆژگاری پاشایەتی هورموز یانزە ساڵ و نۆ مانگی خایاند. بەوتەی هەندێ کەس دوانزە ساڵ. پیش ئەو یا دوای ئەو هیچ پاشایەکیان لەئێران کوێر نەکرد.

لەکارە باش و هەڵس و کەوتە پەسەندەکانی ئەو، ئەوەی کەدەگێرنە کاتێك لەدروست کردنی ماڵەکەی خۆی (بەشێوەیەك کەدەیروانی سەر دیجلە لەبەرابەر مەداین)تەواو بوو، خواردنێکی فەراوانی ئامادە و سفرەیەکی گەورەی راخست و

لەهەموو شوێنەکانەوە خەڵکی بۆ سەر سفرەکەی بانگ کرد. ئەوسا پرسی: ئایا لەماڵەدا هیچ کەم وکوڕیەکتان بینی؟ هەمووان وتیان: نەمانبینی. پیاوێك هەستا و وتی: تیایدا سێ ئیراد بەرچاو دەکەوێت. یەکەم ئەوەی خەڵك ماڵی خۆی لەدنیادا دروست دەکات و تۆ دنیات لەماڵی خۆتا جێگە کردۆتەوە. تۆ لەفراوان کردنی هەیوان و ماڵەکانی لەسنور تێپەریوی چوونکە رێگات بۆ خۆر و هۆکارە ژەهراویەکان ئاوەلاّ کردووە و ئەمە شتێکە دەبێتە هۆی رەنجانی ئەوانەی لێرە دەمێننەوە و لەزستان سەرمای زۆر دروست دەکات. دووەم ئەوەی پاشاکان ماڵی خۆیان لەسەر روبارەکان دروست دەکەن تا دیمەنی ئاو و سەوزی هەبێت و لەم رێگاوە مەلی بیر و ئەندێشەیبان بفرێت و چاوەکانیان روناك ببێتەوە. تۆ دیجلەت پشت گوێ خست و ماڵەکەت لەم بیابانەدا دروست کرد. سێ ئەوەی ماڵی ژنانت لەژێردەستی (باکور یا خوارەوەی با)ماڵی پیاوان دروست کردووە بەشێوەیەك کەبەردەوام با ئاوازی ژنان و بۆنی خۆشی ئەوان بەگوێ و لوتی پیاوان دەگەیەنێت و ئەمە کارێکە پیاوەتی پەسەندی ناکات و پیاو پێی هەڵناستێت.

هورموز وتی: فراوانی ماڵ و هەیوانەکان و شوێنی دانیشتن، باشترینی ماڵەکان ئەوەیە چاو تیایدا بفرێت. گەرمای زۆر و سەرمای سوتێنەر دەتوانین بەباوەشێن، پەردە و ئاگر و جلّ و بەرگ چارە بکەین. بەلاّم دروابسێیەتی دەریا، دەبێت بڵێم لەماڵێکدا دەژیام لەوێوە دەمروانییە سەر دیجلە. رۆژێك کەشتیەك رۆشتە ژێرئاو و دانیشتوانی کەشتی هاواری هاوکاریان بەرزبوویەوە و باوکم بۆیان بەداخ و فەرمانی بەکەشتیەکانیتر دا هاوکاریان بکەن. تا ئەمان گەشتن ئەوان لەناودا خنکان. لەوکاتەوە پەیمانم بەست نەبمە دروابسێی پاشایەکی لەخۆم بەهێزتر. بەلاّم دروست کردنی ماڵی ژنان لەباکور، لەبەر ئەوەیە باکوور هەوای نەرم و ئازاری کەمتری هەیە وژنان بەردەوام لەماڵەوەن( رەوا نییە ئەوان بخرێنە ژێر زەخت و گوشارەوە و لەناو ماڵەکان برزێن). ئەم کارە لەبەر ئەوە بوو. بەلاّم داستانی پیاوەتی ئەوەیە کەلێرە پیاوان بوێری ئەوەیان نییە بەتەنیا برۆنە لای ژنان و هەر کەس دێتە ئەم ماڵە کۆیلە یا بەندەی گەورەیەکە. بەلاّم تۆ ئەم قسانەت جگە لە رق نەکرد. منی لێ ئاگادار بکەرەوە.

پیاو وتی: من دێ یەکەم هەیە کەداهاتەکەیم دەکردە خەرجی نانخۆرەکانی خۆم. سنوردار بەسەر مندا زاڵ بوو و دەستی بەسەردا گرت و لێی سەندم. مەبەستی هاتن بۆ دەرباری تۆم کرد و دوو ساڵ لەدرگای تۆمامەوە تا لەتۆ بپارێمەوە بەلاَم تۆم نەبینی مۆڵەتی بینینی تۆیان بەمن نەدا. مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای وەزیرەکەی تۆم کرد و لای ئەو پارامەوە بەلاَم ئەو مافی منی وەرنەگرت. من تا ئێستا باجی دێ دەدەم تا ناوم لێی پاك نەبێتەوە. ئەمە گەورەترین ستەمە کەمن باجەکەی بدەم و داهاتەکەی کەسێکیتر بیبات.

هورمز لەوەزیرەکەی خۆی پرسی و ئەویش قسەی پیاوەکەی بەراست زانی و وتی: ترسام سنوردار ئازارم بدات. هورموز فەرمانیدا لەسنوردار دوو بەرابەری ئەوەی داویەتی وەربگرێتەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ و بەو پیاوەی بدەن تا لەهەر شوێنێك دەیەوێت بەکاری ببات. ئەو وەزیرەکەی لەسەر کار لابرد و بەخۆی وت: ئەگەر وەزیر لەستەمکار دەترسێت، کەسانیتر شیاوترن بۆ ترس. فەرمانیدا سنوقێکیان دانا، قوفڵی دەکرد و بەئەنگوستیلەکەی خۆی مۆری دەکرد و لەدرگای کۆشك دایدەنا. سنوقەکە کەلێنێکی هەبوو کەسکالاَکەران سکالاکانیان خۆیان تێدەخست. ئەو حەفتەی یەك جار دەیکردەوە و ستەمکارانی دەدۆزییەوە و بەدوای کاری خەڵکدا دەرۆشت. دوبارە بیری کردەوە و وتی: دەمەوێت سکالاَی خەڵك لەدەمی خۆیانەوە ببیستم. لەبەرئەمە زنجیرێکی هەڵگرت کەسەرێکی لەئاسمانی ماڵەکەی و شوێنی دانیشتنی ئەو و سەرەکەی تری لەدەرەوەی ماڵەکەی بوو. زنجیر لەدەلاقەیەکدا بوو و زەنگێکی پێوە هەلاَواسرابوو. سکالاَکەر زنجیرەکەی رادەکێشا و زەنگەکە بەرزدەبوویەوە و ئەوی ئاگادار دەکردەوە. ئەو سکالاَکەری بانگ دەکرد و ئازاری دڵی کەم دەکردەوە.

## پاشایەتی خوسرەو پەرویز کوڕی هورموز

یەکێك لەبەهێزترین و سەختگیرترین پاشاکانی ئێران و زیرەکترین و وردبینترین ئەوان بوو. پێگەیەکی بەرزی لەسۆنگەی بوێری و بەهێزییەوە بەدەست هێنا و سامانەکانی کۆکردەوە و بەخت و چارەنوس هاوکاریان کرد. لەم لایەنانەوە پاشاکانی پێش خۆی پێی نەگەشتبوون. لەبەر ئەمە پێیان دەوت پەرویز(یانی پیرۆز). لەژیانی باوکی بەهرامی چوبینە لای هورموز دووزمانی کرد کەپەرویز پاشایەتی بۆ خۆی دەوێت. کاتێك ئاگاداری ئەم کارە بوویەوە بەنهێنی بۆ ئازەربایەجان رۆشت یا کارێکیتری کرد کەئاماژەی پێدرا. کاتێك گەشتە ئازەربایجان، گەورەکانی ئەو دەڤەرە بۆ پاشایەتی ئەو پەیمانیان بەست و خەڵکانی مەداین بڕیاریاندا باوکی لەسەر تەخت لاببەن و لەچاڵی نێن. کاتێك پەرویز ئەم هەواڵەی بیست هەوڵیدا پێش بەهرامی چوبینە بگاتە مەداین. ئەو هاتەشارەکە و تاجی لەسەر نا و لەسەر تەخت دانیشت و دواتر رۆشتە لای باوکی کەکوێریان کردبوو. بەباوکی وت: تاوانی لەم کارەدا نییە و هەڵاتنی لە ترسی باوکی بووە. باوك وتەکانی ئەوی بەراست زانی و داوای لێکرد هەر رۆژ کەسێکی بنێرێتە لای تا خوی پێبگرێت و ئارام ببێت. هەروەها داوای کرد دادی ئەو لەوکەسانەی لەسەر تەخت لایان برد و کوێریان کرد، وەربگرێت. ئەو بیانوی هێنایەوە کەبەهرامی چوبینە لەگەڵ سوپاکەی لەنزیك پایتەختە و لەبەر ئەمە جگە لەسەرکەوتن بەسەر بەهرام ناتوانێت تۆڵەی ئەو بستێنێت.

بەهرام رۆشتە نەهرەوان و پەرویز مەبەستیی ئەوێی کرد. شەڕ رویدا و پەرویز بینی هاوەڵانی لەشەڕدا سستی دەکەن. پاشەکشێی کرد و هاتە لای باوەکی و بۆی گێرایەوە و راوێژی پێ کرد. باوك پێی وت بڕواتە لای موریس پاشای رۆم. ئەو جارێکیتر لەشکری رازاندەوە و بەدەستەیەکی بێ وێنە کەدوو خاڵۆکەی بەستام و بەندویە و کردویە براکەی بەهرام لەناویاندا بوون، هاتەدەر. کاتێك هاتەدەر، هاوەڵانی ترسان بەهرامی چوبینە باوکی بگەڕێنێتەوە بۆ سەر تەخت و کەس بۆ

لای پاشای رۆم بنێرێت و خوازیاری گەرانەوەی ئەوان بێت و پاشای رۆم ئەوان بێنێتەوە سەر تەخت. لەبەر ئەمە داوای مۆڵەتیان لەپەرویز کرد تا باوکی بکوژن. وەڵامی نەدایەوە. بەندویە و بەستام و دەستەیەك لەهاوەڵانیان گەرانەوە بۆ لای هورموز و ئەویان خنکاند و گەرانەوە بۆ لای پەرویز و بەپەلە بەرێکەوتن تا لەفورات تێپەرین و رۆشتنە ناو ماڵێك بۆ ئەوەی بحەوێنەوە. کاتێك رۆشتنە ناو ماڵەکە، سوپاکەی بەهرامی چوبینە کە لەپێشیانەوە پیاوێك بەناوی سیاوەش بوو، گەمارۆیان خستنە سەر. بەندویە بەپەرویزی وت: بیر لەچارەیەك بۆ خۆت بکەرەوە. پەرویز وتی: چارەیەك نابینم. بەندویە وتی: من گیان لەرێگەی تۆ دەبەخشم. بەندویە داوای جلەکانی پەرویزی کرد و لەبەری کرد. پەرویز و هاوەڵانی لەدرگایەکی دیکەوە هاتنەدەر و بۆ کوێستان رایانکرد و لەوێ خۆیان داشارد. بەهرام کوری سیاوەش گەشتە ماڵەکە و بەندویەی بەجل و بەرگی پەرویزەوە بینی و گومانی کرد بەراستی پەرویزە. بەندویە تکای کرد تا بەرەبەیان مۆڵەتی پێبدات تا خۆی بپرواتە لای و بێ شەر خۆی بدات بەدەستەوە. ئەو رازی بوو. بەیانی بەهرام کوری سیاوەش بەفریوەکەی بەندویەی زانی و ئەوی گرت و بردییە لا ی بەهرامی چوبینە. بەهرامی چوبینە هاتە پایتەخت و تاجی لەسەرنا و پاشایەتی گرتەدەست. خەڵك پشتیان تێکرد بەڵام لەترسا ملکەچی بوون. بەهرام کوری سیاوەش لەگەڵ بەندویە بریاریاندا لەناکاو بەهرامی چوبینە بکوژن. بەهرامی چوبینە ئەمەی زانی و بەهرام کوری سیاوەشی کوشت و بەندویە رایکرد و روی کردە ئازەربایجان. لەولا خوسرەو پەرویز رۆشتە ئەنتاکیە و هاوەڵانی خۆی بۆ لای پاشای رۆم نارد. پاشای رۆم مژدەی هاوکاری پێدا و پەرویز کچەکەی ئەوی بەناوی مریەم وەك هاوسەر هەڵبژارد. ئەو سوپایەکی حەفتا هەزار کەسی بۆ هاوکاری پەرویز ئامادەکرد. لەناو ئەوان شەرکەرێك دەبینرا لەگەڵ هەزار پیاو بەرابەری دەکرد. پەرویز ئەوانی رێکخست و بەرەو ئازەربایجان کەوتە رێ. لێرە بەندویە لەگەڵ پێشەنگەکانیتر و ئەسواران لەگەڵ چل هەزار پیاوی شەرکەر لەئیسفەهان و فارس و خوراسان پەیوەستی بوون و بەرەو مەداین بەرێکەوتن. بەهرامی چوبینە روبەرووی بوویەوە و لەنێوان ئەوان چەندین شەری قورس رویدا.

ئەو شەڕکەرەی لەگەڵ هەزار پیاو بەرابەری دەکرد، کوژرا بەڵام بەهرامی چوبینە شکستی خوارد و بەرەو تورکان رایکرد. خوسرەو پەروزی لەئوردوو هاتەدەر و رۆشتە ناو پایتەخت و سامانی لەناو رۆمیەکاندا دابەش کرد. هەمووی ئەم سامانانە بەبیست هەزار (بیست ملیۆن)(درەم؟ دینار؟ چی) خەملێنرا. ئەوانی بۆ وڵاتەکەیان ناردەوە.

بەهرامی چوبینە لای تورکەکان مایەوە و رێزدارانە ژیانی بەسر برد. پەروزی پەیك و پەیامی دیاری گرانبایی لە گەوهەر و زێر بۆ هاوسەری پاشای تورك نارد و داوای لێکرد بەهرام بکوژێت. ژن کەسێکی راسپارد تا بەهرام بکوژێت و کوشتی. کوژرانی ئەو لای پاشای تورك ناخۆش و دواتر زانی هاوسەرەکەی بەم کارە هەستاوە و لەبەر ئەمە بەرەڵای کرد. دواتر پەرویز بەندویەی کوشت و ویستی بەستامیش بکوژێت بەڵام ئەو رایکرد و لەتەبەرستان قەڵای گرت. پەرویزکەسی نارد و ئەویشی کوشت.

رۆمیەکان پاشاکەیان لە واردەهەمینساڵی پاشایەتی پەرویز لەسەر کار لابرد و کوشتیان و بەتریقێك بەناوی فوکاسیان کردە پاشای خۆیان. مناڵەکان و بنەماڵەی موریس خوازیاری پاشایەتی یەکێك لەکورەکانی ئەو بوون کەبۆ لای پەرویز هەڵاتبوون. ئەو سوپای کردە هاورێی و ئەوانی بۆ سەر تەخت گەراندەوە و کردی بەفەرمانڕەوایی رۆم و فەرماندەیی سوپاکەی خۆی بەسیان لەئەسواران و ئەفسەرانی خۆی سپارد. یەك لەوان بەپوران ناودەبرا. خوسرەو هاورێ لەگەڵ سوپایەك بۆ شامی نارد و ئەو رۆشتە قوڵای شام تا گەشتە بیت المقدس و ئەو دارەی مەسیحیەکان گومان دەکەن عیسای پێ لەخاچ دراوە، هەڵگرت و بۆ پەرویزی نارد. فەرماندەی دووەمیان بە شاهین ناو دەبرد. پەرویز ئەوی لەگەڵ سوپایەك بۆ میسر نارد و دەستی بەسەردا گرت و کلیلەکانی ئەسکەندەرییەی بۆ خوسرەو پەرویز ناردەوە. فەرماندەی رۆم کەبەرزترینیان بوو، بەفەرخان بانگ دەکرا. ئەو فەرماندەیی دوو ئەفسەرەکەی پێشوی بەو سپارد. دایکی ئەو ژنێکی بەبەرهەم بوو کەجگە لەکور مناڵی نەدەبوو. پەرویز ئەوی بانگ کرد و وتی: دەمەوێت سوپایەك بۆ رۆم بنێرم و دەستەیەك لەکورەکانی تۆیش لەگەڵیدا. پێم بڵێ کامیان بکەمە فەرمانده. وتی:

بەهمان لەڕێوی دەچێت و لەشاهین بیرتیژترە. فەرخان لەڕم کاریگەرترە. شەهر بەراز بەم شێوە و بەو شێوەیە لەفرەزانیدا.

پەرویز وتی: ئەم فرەزانە دەکەمە فەرماندە. ئەو فەرماندەیی سوپاکەی بەو سپارد و شەهر بەراز روی کردە رۆم و ئەوانی کوشتار و ولآتەکەیانی خاپور و وێران کرد. داری لەولآتەکەیان بڕی و لەقولآی ولآتەکەیان تا کۆنستانتین نۆپێڵ (قوستەنتینە) رۆشتە پێش و لەکەنداوی نزیك ئەوێ دابەزی، هێرشی دەبرد و تالآنی دەکرد و وێرانی دەکرد بەلآم کەس ملکەچی پاشایەتی و گوێرایەڵی کورەکەی موریس نەبوو جگە لەوەی رۆمیەکان فوکاسیان بەهۆی خراپەکاری ئەوەوە کوشت و هراکلیوسیان دوای ئەو هێنایە سەرتەخت و ئەو هەمان کەسە موسوڵمانەکان شامیان لەدەست دەرهێنا.

کاتێك هراکلیوس بینی چ وێرانی و تالآنییەك بەسەر ولآتەکەیدا هاتووە، لەدرگای خوای گەورە پارایەوە و گریا. ئەو پیاوێکی لەخەودا بینی کەریشێکی پڕ و پێگەیەکی بەرز و جل و بەرگێکی جوانی لەبەردابوو. لەم کاتەدا(لەخەودا) کەسێك هاتە لای ئەو دووانە و ئەو پیاوەی لەشوێنی دانیشتنەکەی هێنایە خوار و بەهراکلیوسی وت: ئەو بەتۆ دەسپێرم. هراکلیوس خەبەری بوویەوە و خەوەکەی بۆ کەس نەگێرایەوە. شەوی دووەم دووبارە لەخەودا بینی ئەو پیاوە لەشوێنەکەی خۆی دانیشتووە. لەم کاتەدا دوبارە کەسی سێیەم بەزنجیرێکەوە هات و کردییە ملی ئەو پیاوە و بەهراکلیوسی سپارد و وتی: من خوسرەو دەرەبست بەتۆ دەسپێرم. برۆ شەڕی ئەو بکە کەبەسەریدا سەردەکەویت و تۆڵە لەدوژمن دەکەیتەوە. لەم کاتەدا بوو خەوی خۆی بۆ گەورەکانی رۆم گێرایەوە. ئەوان بۆ شەڕ کردن لە گەڵ خوسرەو ڕێنونییان کرد. هراکلیوس ئامادەی شەڕ و یەکێك لەکورەکانی خۆی لە کۆنستانتین نۆپێل دانا و ڕێگەیەکی جیاواز لەڕێگای شەهر بەراز، بڕی. لەقولآیی ئەرمەنستان پێشرەوی کرد و مەبەستی گرتنی جەزیرەی کرد و لەنەصیبین دابەزی. خوسرەو لەشکری بۆ روبەروبوونەوەی ئەو نارد و فەرمانی بەسوپاکەیدا لەکوسڵ چاوەڕێ بن. پەیامی بۆ شەهر بەراز نارد و فەرمانی گەڕانەوەی پێدا تا هەمووان بتوانن لەبەرابەر هراکلیوس خۆراگری بکەن. لەبارەی چۆنیەتی لەشکرکێشانی ئەو

ئاماژە بەبابەتی دیکە دراوە. یەکێك لەم گێڕانەوانە دەڵێت: شەهر بەراز رۆشتە ناو ڕۆم و شامی ژێرورووو کرد تا گەشتە سەرزەمینی ئەزەرعات و ڕووبەرووی سوپای ڕۆم بوویەوە و ئەوانی تێکشکاند و بەسەریاندا زاڵ بوو. زۆربەیان بەدیلی گرت و تاڵانی کرد کۆتایی بەهێرش کردنەکەی هێنا.

ڕۆژێك فەرخان شەرابی خوارد و وتی: لەخەودا بینیم لەسەر تەختی خوسرەو پەرویز دانیشتووم. خوسرەو ئەمەی بیست و بۆ براکەی ئەو شەهەر بەراز نامەی نوسی و فەرمانی کوشتنی دا. شەهر بەراز وەڵامی پەرویزی دایەوە کە فەرخان بوێرەو بەئاسانی دوژمنان لەناو دەبات. خوسرەو جارێکیتر نامەی نوسی و فەرمانی کوشتنی فەرخانیدا. دوبارە شەهر بەراز نامەی نوسی و بیانوی هێنایەوە. بۆ سێیەم جار خوسرەو پەرویز نامەی نوسی بەڵام شەهر بەراز ئەوی نەکوشت. لەبەر ئەمە پەرویز نامەی لەکار لابردنی شەهر بەراز و فەرماندەیی گشتی فەرخانی دەرکرد. شەهر بەراز فەرمانی برد. کاتێك فەرخان بووە فەرماندە. نامەبەر نامەی لەخوسرەو پەرویزەوە هێنا و کەفەرمانی کوشتنی شەهر بەرازی تیی نوسرابوو. فەرخان مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام شەهر بەراز داوای لێکرد مۆڵەتی بدات بۆ ئەوەی وەسیەتی خۆی بنوسێت. مۆڵەتی پێدا. شەهر بەراز تۆمارێکی ویست و سێ نامەکەی خوسرەو پەرویزی نیشاندا و ئاگاداری کردەوە و وتی: سێ جار بوومە نێوەنجیگەر و تۆم نەکوشت و تۆ دەتەوێت بەیەك نامە من بکوژیت. براکەی داوای لێبووردنی کرد و ئەوی گەڕاندەوە سەر تەختی فەرماندەیی و هەردووك بۆ سازان لەگەڵ پاشای ڕۆم دژی خوسرەو پەرویز بڕیاریاندا. شەهر بەراز نامەی بۆ هراکلیوس نوسی و وتی من پێویستییەکم بەتۆ هەیە کە پەیك ناتوانێت بیگەیەنێت و نامە توانای ئەوەی نییە. هاورێ لەگەڵ پەنجا ڕۆمی وەرە سەردانی من کەمن بەپەنجا پیاوی ئێرانی دێمە سەردانی تۆ. سزار بەهەموو سوپاکەی خۆیەوە هات و سیخورەکانی دانا تاراستی قسەکەی شەهر بەرازیان بۆ دەرکەوێت چوونکە دەترسا فێڵێك لەئارادا بێت. سیخوران گەڕانەوە و وتیان شەهر بەراز لەگەڵ پەنجا ئێرانی هاتووە. پاشای ڕۆم هاتە سەردانی و هەمان ژمارەی لەپیاوانی شەرکەر لەگەڵ خۆی برد و لەنێوان ئەوان چەندین وەرگێر دەبینران کەوتەکانی ئەوانی دەگواستەوە.

شەهر بەراز پێی وت: من و براکەم ولآتەکەی تۆمان وێران کرد و ئەوەمان کرد کەخۆت دەیزانی. ئێستا خوسرەو رژدی بەئێمە دەبات و دەیەوێت ئێمە بکوژێت. ئێمە ئەومان لەسەر کار لابردووە و دەمانەوێت هاورێ لەگەڵ تۆ شەڕ بکەین. هراکلیوس لەم وتەیە شادمان و هەردوولا لەسەر ئەوە رێکەوتن وەرگێرەکان بکوژن تا نهێنییەکەیان ئاشکرا نەبێت. هراکلیوس لەگەڵ سوپاکەی خۆی رویکردە نەسیبین.

ئەم هەواڵە بەخوسرەو پەرویز گەشت و یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی بەناوی راهزار لەگەڵ دوانز هەزار سوپایی بۆ شەڕی هراکلیوس نارد و فەرمانی پێدا لەنەینەوا لەسەرزەمینی موسڵ بمێنێتەوە و لەدیجلە ئوردو لێبدات و رێگە نەدات هراکلیوس بپەرێتەوە. ئەو لەدەستگردی پاشایەتی(دەسکە الملك) مایەوە. رەهزار سیخورەکانی نارد و ئەوان ئاگاداریان کردەوە کەهراکلیوس حەفتا هەزار پیاوی شەڕکەری لەگەڵدایە. ئەو پەیامی بۆ خوسرەو پەرویز نارد وئەوی ئاگادار کردەوە و وتی لەشەڕ کردن لەگەڵ هراکلیوس ناتەوانە چوونکە ئەو سوپا گەورەی لەژێر فەرماندایە. خوسرەو پەرویز بەبیانوەکەی رازی نەبوو و فەرمانی شەڕی پێدا. ئەو فەرمانی برد و سوپاکەی خۆی رازاندەوە. هراکلیوس هێرشی کردە سەر سوپاکەی پەرویز و دوورتر لەشوێێنی ئوردووی راهراز لەدیجلە گوزەری کرد. راهزار مەبەستی ئەوی کرد و هەردووك چاویان بەیەك کەوت و شەڕ دەستی پێکرد. راهزار و شەش هەزار لەپیاوانی کوژران و پاشماوەکان هەلآتن. خوسرەو لەدەستگردی پاشایەتی بوو کەهەواڵەکەی پێگەشت. ترسا و بۆ مەداین گەرایەوە و سەنگەری گرت چوونکە توانای خۆراگری لەبەردەم هراکلیوسی نەبوو. نامەی بۆ فەرماندەکانی سوپا تێکشکاوەکەی نوسی و ئەوانی لەسزادان ترساند و بەم شێوە زیاتر تورەیی ئەوانی بزواند. هراکلیوس تا دەروازەکانی مەداین رۆشتە پێش و دواتر بۆ ولآتەکەی خۆی گەرایەوە.

هۆکاری گەرانەوە ئەوە بوو کاتێك خوسرەو توانای خۆراگری لەبەردەم هراکلیوسی نەما روی کردە فێڵ و نامەیەکی بۆ شەهر بەراز نوسی و وەسفی کرد و سپاسی کرد و وتی: کارێکی باشت کرد کەفەرمانی منت بەکاربەست و تێکەڵ

بەپاشای رۆم بوویت و ئەوت تا قولایی ولات هێنایە پێش. ئێستا کە ئەو لەقولایی ولاتی ئێمە خێوەتی هەلداوە و دەستی ئێمەی لەسەر خۆی ئاوەلا کردووە، باوەرم وایە تۆ لەپشتەوە هێرشی بکەیتە سەر و من لەپێشەوە و کۆبوونەوەی ئێمە لەفلان رۆژ بێت وبەم شێوە یەك کەس لەوان رزگاری نەبێت. ئەوسا نامەکەی لەداردەستێکی ئاونوسدا شاردەوە و خواپەرستێکی مەسیحی کە لەمالێك لەنزیك مەداین دەژیا، بانگ کرد و پێی وت: پێویستیم بەتۆ هەیە. ئەو پیاوە وتی: پاشا گەورەترە لەوەی پێویستی بەمن بێت بەلام خزمەتکار و فەرمانبردارم. پەرویز وتی: رۆمیەکان لەنزیك ئێمە دابەزیون و رێگایان لێ بەستووین. پێویستم بە هاورێکانم لەشامە و تۆ پیاوێکی مەسیحیت و ئەگەر لای رۆمیەکان تێپەریت لەکارەکەی تۆ سەریان سورنامێنێت. من نامەیەکم بۆ شەهر بەراز نوسیوە کە لەناو ئەم داردەستەدایە، بیگەیەنەرە دەست شەهر بەراز. پەرویز دووسەد دیناری بەو پیاوە بەخشی. پیاو داردەستەکەی کردەوە و نامەکەی خوێندەوە وبەرێکەوت. کاتێك گەشتە سوپای رۆم و رۆمی و ناقوس و خۆپارێزەکانی بینی، دلی بۆیان سوتا. بەخۆی وت: لەخراپترینی خەلکانم ئەگەر رۆمیەکان لەناو ببەم. رۆشتە خێوەتی پاشا و لەرووداوەکە ئاگاداری کردەوە و نامەکەی پێدا. ئەو نامەکەی خوێندەوە. لەم کاتەدا پیاوەکانی پیاوێکیان لەشام گرتبوو کەنامەیەکی پێبوو و خوسرەو پەرویز لەگەلێدا هاودەست ببوو. خوسرەو ئەم نامەی لەزمانی شەهر بەرازەوە بۆ خۆی نوسیبوو کەدەیوت: من بەردەوام سەرقالی فریودانی پاشای رۆم بووم تا باوەری پێکردم بەو شێوەی تۆ فەرمانت دابوو لەکاریگەری فریوەکەی من تا قولایی ولات هاتە پێش. ئێستا پاشا بفەرمێت رۆژی چاوپێکەوتن لە چ رۆژێك دەبێت تا لەپشتەوە هێرشی بکەمە سەر و پاشا لەپێشەوە و هیچ کەس لەسوپاکەی تەنانەت خۆی رزگاری نەبێت. خوسرەو بەم نامەبەرەی وتبوو لەشوێنێکەوە بروات بکەوێتە دەست رۆمیەکان.

کاتێك پاشا نامەی دووەمی خوێندەوە، هەوالی یەکەمی بەراست زانی و بێ گومان باوەری پێیکرد و وەك تێکشکاوان مەبەستی راکردن و گەرانەوە بۆ ولاتەکەی خۆی کرد. هەوالی گەرانەوەی پاشای رۆم بەشەهر بەراز گەشت و ئەو ویستی کارەکانی

پێشوی خۆی قەرەبوو بکاتەوە لەبەر ئەمە روبەروی رۆمیەکان بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت و لەنامەیەکدا بۆ خوسرەو نوسی: فێلێی خۆم لەگەڵ رۆمیەکان بەکار برد تا هاتنە عێراق ( ئەوانم لێرە کوشتار و تالآن کرد). شەهر بەراز ژمارەیەکی زۆری لەسەری کوژراوە رۆمییەکان بۆ خوسرەو نارد. لەبارەی ئەم روداوە بوو خوا ئەم ئایەی دابەزاند: الف، لام، میم. رۆمیەکان لەنزیکترین شوێنی زەوی شکستیان خوارد بەلآم ئەوان دوای ئەم تێکشکانە سەردەکەون (رۆم/٣٠/٢—١). مەبەستی لەنزیکترین شوێنی زەوی ئەزەرعاتە کەنزیکترین شوێنی سەرزەمینی رۆمییەکان بەسەرزەمینە عەرەبیەکانە. رۆمیەکان لەیەکێك لەشەڕەکانی خۆیان لێرە شکستیان خواردبوو. پێغەمبەر و موسوڵمانەکان لەسەرەتا لەسەرکەوتی ئێرانییەکان بەسەر رۆمیەکان (چوونکە خاوەنی کتێبن) ناشادمان بوون. کافرەکان شادمان چوونکە ئاگرپەرەستەکان وەك ئەوان بێ کتێبن. کاتێك ئەم ئایە دابەزی ئەبووبەکەری سدیق گرێوی لەگەڵ ئوبەی کوڕی خەلەف کرد کەرۆمیەکان تا نۆ سالێتر بەسەر ئێرانییەکاندا سەردەکەون. گرێوەکە لەسەر سەد وشتر بوو. ئەبووبەکر گرێوەکەی بردەوە. لەم کاتەدا گرێو کردن کارێکی نارەوا بوو. کاتێك رۆمییەکان بۆ جارێکیتر سەرکەوتنەوە، هەواڵەکەی بەپێغەمبەر گەشت کەلەشەڕی حوّدەیبیەدا بوو.

## ئەو نیشانانەی خوسرەو لە پێغەمبەری خوای بینی

یەك ئەوە بوو خوسرەو پەرویز لەبەردەم دیجلە العورا ئاوبەستێکی گەورەی دروست کرد و سامانی زۆری تیا بەکار برد (دیجلە العورا یەکێك لەلقەکانی دیجلە لەنزیکی بەسرەیە). تاقی هەیوانەکەی ئەو بینایەکی زۆر بەرز و بەهێزی بوو کەهاوتاکەی نەبینراوە. لەدەرباری ئەو سێسەد وشەست پیاو لەوشیاران و پێشگویان لەکاهینە و جادوگەر و ئەستێرەناسان دەژیان. لەناو ئەوان پیاوێك بوو لەعەرەب بەناوی سایب کەبازان ئەوی لەیەمەنەوە بۆ دەرباری خوسرەو ناردبوو. کاتێك خوسرەو خەمبار دەبوو، ئەوانی کۆدەکردەوە و دەیوت: لەم کارە وردببنەوە، بزانن چۆنە.

کاتێك محەممەد بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردرا، تاقی هەیوانی خوسرەو پەرویز بێ قورسایی قەڵشتی برد و لەئاوبەستی دیجلە العورا درز دروست بوو. کاتێك ئەمەی بینی، وتی: کۆشکی هەیوانم قەڵشتی برد بێ ئەوەی شتێك قورسایی لەسەر بکات و ئاوبەستی دیجلە العورا درزی برد بێ ئەوەی زەختی لێبکرێت. وتی: شا شکا. ئەوسا کاهینان و جادوگەران و ئەستێرەناسانی کۆکردەوە و سایب لەگەڵیاندابوو. بەوانی وت: بەوردی لەم کارە بڕوانن. ئەوان وردبوونەوە بەڵام قەراغەکانی ئاسمانیان لەسەر داخرا و زەوی رەش و تاریك داگیرسا. ئەوەی دەیانوست بەدەستیان نەهێنا. سایب لەشەوێکی رەش و تاریك، شەوی لەسەر تەپۆڵکەیەك رۆژ کردەوە. لەناکاو هەورە بروسکەیەکەی بینی لەحیجازەوە هەستا و رۆژهەڵات زەمینی داپۆشی. کاتێك شەوی کردە رۆژ، لەژێر قاچی خۆی بێستانێکی سەرسەوزی بینی و لەسەر ئەم بنەمایە، لەناو پێشگوییەکانی خۆی وتی: ئەگەر ئەوەی دەیبینم راست بێت، بێ گومان لەحیجاز پاشایەك دێت کە فەرمانەکانی رۆژهەڵات زەوی دەگرێتەوە و زەوی بەشێوەیەك بۆ ئەو دەبێت هیچ کات بۆ پاشایەك نەبووە.

کاتێك کاهین و ئەستێرەناسان و جادوگەران کۆبوونەوە و بینیان چییان بەسەردا هاتووە، و سایب لەچاوەکانی خۆی روانی، بەیەکیان وت: سوێند بەخوا لەنێوان ئێوە

و زانستەکەتان جگە لەرووداوێکی ئاسمانیی جیایی دروست نەکردووە. ئەو پێغەمبەرێکە هەڵبژێردراوە یا هەڵدەبژێردرێت و ئەم پاشایەتییە دەروخێنێت و لەناوی دەبات. ئەگەر هەواڵی ئەم رووداوە مەرگ ئافرێنە بەخوسرەو بدەن، بێ گومان هەمووتان دەکوژێت. ئەوان پەیمانیان بەست لەخوسرەوەی بشارنەوە. پێیان وت: وردبووینەوە و بینیمان بناغەی ئاوبەستی دیجلە العوراء و تاقی هەیوانی شایی لەکاتژمێرێکی شوومدا دانراوە. کاتێك شەو و رۆژ بەدوای یەکدا هاتن و رۆشتن، شومی جێگەی ئەوانی گرتەوە و ئەوەی لەو کاتەدا بنیات نرا بوو، لەناوی برد. ئێمە بەشێوەیەك کاتژمێرەکان بۆ تۆ دادەرێژین بناغەی بیناکانی خۆت لەسەر ئەو بنەمایە دارێژیت تا کەلێنیان تیا دروست نەبێت. ئەو کارەیان کرد و پێشنیاری بینایان پێکرد. ئەو دیجلە العوراءی لەماوەی هەشت مانگدا دروست کرد و سامانێکی زۆری تیا بەکار برد. کاتێك تەواوی کرد، بەوانی وت: ڕەوایە لەسەر دیوارەکەی دانیشم؟ وتیان: ڕەوایە. ئەو لەگەڵ ئەسوارانی خۆی لەوێ دانیشت بەڵام لەناکاو ئاوی دیجلە بیناکەی ئەوی لەبناغەوە تێکشکاند و ئەو نیوە گیان لەژێر وێرانییەکان هاتەدەر. لەبەر ئەمە کاهین و ئەستێرەناس و جادوگەرانی خۆی کۆکردەوە و نزیکەی سەد کەس لەوانی کوشت و وتی: ئێوەم لەخۆم نزیك و سامانی زۆرم پێ بەخشین و ئێستا لەگەڵ مندا گەمە دەکەن! وتیان: ئەی پاشا، وەك جاری پێشو ناراستمان وت. جارێکیتر ئەو کارەیان بۆ ئەنجامدا و ئەو بینای دروست کرد. پێیان وت لەسەر بەرزاییەکەی دانیشێت. ئەو ترسا، سوار لەسەرئەسپ رۆشتە سەر بیناکە. هەرئەوەندەی دەستی بەرۆشتن کرد ئاوی دیجلە بیناکەی روخاند و ئەویان نیوە گیان هێنایەدەر. ئەوانی بانگ کرد و وتی: سوێند بەخوا بێ چەند و چون هەمووتان دەکوژم مەگەر ئەوەی راستیم پێبڵێن. ئەوان راستیان پێوت. وتی: هاوار لەئێوە! بۆ لەسەرەتاوە راستیتان نەوت تا بیر لەچارەیەك بکەمەوە؟ وتیان: ترساین. ئەوانی بەجێهێشت و کاتێك بینی توانای خۆراگری لەبەردەم دیجلەی نییە، وازی هێنا. ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی لەوێ چەندین زۆنکاوی گەورە دورست بێت کە پێش لەوە نەدەبینران. سەراسەری زەوییەکەی ئاوەدان بوو.

کاتێك ساڵی شەشەمی کۆچی / ٦٢٨ زایینی دەستی پێکرد، پێغەمبەر، عەبدوللە

کوڕی حوزافەی سەهمی بۆ دەرباری خوسرەو پەرویز نارد. لەم کاتەدا دیجلە و فورات خروشان کەپێشتر هاوشێوەی نەبینرابوو و دوای ئەوەیش نەبینراوە. کەلێن و درزەکان دروست بوون و ئەوەی خوسرەو دروستی کردبوون، لەناو چوون. هەوڵیدا رێگە لەناو بگرێت بەڵام وەك ئاماژەی پێدرا ئاو بەسەریا زاڵ بوو و رویکردە زۆنکاوەکان و کشتوکاڵی داپۆشی و ژمارەیەك لەدێهاتەکانی بردە ژێرئاو. ئەوکاتەی عەرەبەکان رویان کردە ئێران و شەڕ ئێرانییەکانی لەئاوەدان کردنەوەی وڵاتەکەیان دور خستەوە، کەلێن و درزەکان فراوانتر و گەورەتربوون. کاتێك رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی بەحەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی گەشت، کەلێن و درزی تر دورست بوو کە ئەو بەمەبەستی زیان گەیاندن بەجوتیارە ئێرانییەکان چاکی نەکردنەوە چوونکە تۆمەتی لەدێدارە ئێرانییەکان دەدا کەهاوکاری کوڕی ئەشعەسیان کردووە. کارەکە گەورە و بەدبەختی خەڵك زیادی کرد و ئێرانییەکان لەئاوەدان کردنەوەی دوور کەوتنەوە و تا ئێستا بەهەمان شێوەیە.

باوکی سەلەمە کوڕی عەبدوالرەحمان کوڕی عەوف دەڵێت: خوا فریشتەیەکی بۆ خوسرەو پەرویز نارد و ئەو لەژووری ناوەوەی هەیوانەکی بوو، هیچ کەس بوێری رۆشتنەی لای نەبوو. لەناکاو لەکاتی نیمەڕۆ بۆ ماوەیەکی کورت خەوی لێکەوت، ترساو فریشتەی لەسەر سەری خۆی دەبینی کەدەیوت: ئەی خوسرەو باوەڕ بەئایینی ئیسلام دەکەیت یا ئەم داردەستە دەشکێنم؟ خوسرەو وتی: بەڵێ، بەڵێ! ئەوسا پشتی تێکرد و بانگی پاسەوان وپارێزەرانی خۆی کرد و بەتورەی لەگەڵ ئەوان دوا و پرسی: کێ ئەم پیاوەی هێناوەتە لای من؟ وتیان: کەس نەهاتۆتە لای ئێمە و ئێمە کەسمان نەبینیوە! ساڵێکیتر فریشتە لەوکاتەدا هاتەسەر سەری و وتی: ئیسلام هەڵدەبژێریت یا ئەم داردەستە بشکێنم؟ خوسرەو وتی: بەڵێ، بەڵێ! ئەو لەپاسەوان و درگاوانەکانی خۆی تورە بوو. کاتێك ساڵی سێیەم هات، هات و وتی: باوەڕ دێنیت یا ئەم داردەستە بشکێنم؟ خوسرەو وتی: بەڵێ، بەڵێ! ئەو داردەستەکەی شکاند و رۆشتەدەر. زۆری نەخایاند پاشایەتییەکەی بەرەو نەمان ڕۆشت و کورەکەی لەگەڵ ئێرانییەکان هاوپەیمان و ئەویان کوشت.

حەسەنی بەسری دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵگەی خوا بۆ خوسرەو چییە؟ وتی: خوا فریشتەیەکی بۆ نارد کەدەستی خۆی لەدیواری ماڵەکە دەهێنایەدەر و روناکی لێ دەهاتەناو. کاتێك ئەمەی بینی، ترسا. فریشتە پێی وت: ئەی خوسرەو مەترسە! خوا پێغەمبەرێکی هەڵبژاردووە و نوسراوی بۆ ڕەوانە کردووە. شوێنی کەوە تا ئەم دنیا و ئەو دنیا بۆ تۆ پایەدار بێت. خوسرەو وتی: با بزانم.

## گێڕانەوەی داستانی زی قار

لە پێغەمبەر ئەم قسەیان گێڕاوەتەوە: کاتێك سوپای ڕەبیعە بەسەر سوپای خوسرەو زاڵبوو و ئەم هەواڵەی پێگەشت، فەرمووی: ئەمە یەکەم ڕۆژە عەرەبەکان بەسەر ئێرانییەکان زاڵ دەبن و بەهۆی منەوە سەرکەوتن. ئەم قسەی ئەویان هەڵگرت و ئەمە هەمان ڕۆژی ڕوداو بوو.

هشام کوڕی محەممەد دەڵێت: عودەی کوڕی زەید تەمیمی و دوو براکەی عەمار (ئەبی) و عەمرۆ(سەمی) لەگەڵ خوسرەوان دەژیان و لەگەڵ ئەوان خزمایەتیان دەکرد. کاتێك مونزەر کوڕی مونزەر بوو بەپاشای عەرەب، کوڕەکەی نەعمانی بۆ پەروەردە کردن بەعودەی کوڕی زەید سپارد. ئەو جگە لەنەعمان یانزە کوڕی بوو. ئەوانیان لەبەر جوانی ڕوخسار بە(دەرەوشاوەکان) بانگ دەکرد. کاتێك مونزەر کوڕی مونزەر مرد و منداڵەکانی خۆی بەجێهێشت، خوسرەو کوڕی هورموز ویستی کەسێك هەڵبژێرێت و بیکاتە پاشای عەرەبەکان. عودەی کوڕی زەیدی بانگ کرد و پرسیاری کوڕەکانی مونزەری لێکرد. عودەی وتی: پیاوانی بەهێز و گەشە کردوون. خوسرەو فەرمانیدا و ئەوانیان بانگ کرد. ئەو نامەی نوسی و ئەوانی ئامادە کرد. عودەی بەرواڵەت براکانی نەعمانی پێش دەخست و وای نیشان دەدا کەنەعمانی ناوێت. لەگەڵ یەك یەکی ئەوان بەتەنیایی دانیشت و بەهەرکامی وت: ئەگەر خوسرەو پرسی: دەتوانیت عەرەبەکان ملکەچ و فەرمانبرداری من بکەیت، بڵێ، دەتوانم هەموویان ملکەچ و گوێرایەڵ بکەم جگە لەنەعمان. بەنەعمانی وت: کاتێك خوسرەو سەبارەت بەبراکانت لێی پرسی، بڵێ: ئەگەر من لە ملکەچ کردنی براکانم ناتەوان بم لەملکەچ کردنی کەسانیتر ناتەوانترم.

لەناو منداڵەکانی مەرینا پیاوێك بوو پێیان دەوت عودەی کوڕی ئەوس کوڕی مەرینا. پیاوێك وشیار و شارەزای وتاردان. ئەو بەئەسوەد کوڕی مونزەری دەوت: دەزانی هیوام بەتۆیە و چاوم لەتۆ بڕیوە، بەباشی دەزانم گوێ بەقسەی عودەی کوڕی زەید نەدەیت چوونکە ئەو چاکەخوازی تۆ نییە. ئەسوەد گوێی لەقسەکانی ئەو

نەگرت.

کاتێك خوسرەو بەعودەی کوڕی زەیدی وت ئەوان لەگەڵ خۆیدا بێنێت، ئەو یەك یەك ئەوانی هێنا. خوسرەو لەهەرکامی دەپرسی: ئایا دەتوانی عەرەبەکان فەرمانبرداری من بکەیت؟ ئەو دەیوت: هەمووان جگە لەنەعمان. کاتێك نەعمان هاتەلای، پیاوێکی بینی بەروخسارێکی سوور و ناشیرن و کورتەبالآ. لەوی پرسی: ئایا دەتوانیت عەرەبەکان و براکانت فەرمانبرداری من بکەیت؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر نەتوانم ئەوان فەرمانبردار بکەم بۆخەڵکانیتر ناتەوانترم. خوسرەو ئەوی کردە پاشا و تاجی لەسەرنا کەبەهاکەی شەست هەزار درەم خەمڵێنراوە. لەم کاتەدا عودەی کوڕی مەرینا بەئەسوەدی وت: لەخۆت بروانە کەگوێت لەوتەی چاکەخوازی خۆت نەگرت.

دواتر عودەی کوڕی زەید خواردنێکی ئامادە کرد و عودەی کوڕی مەریناى بانگ کرد و وتی: دەمزانی تۆ هاورێکەی خۆت، ئەسوەدت زیاتر لەهاورێکەی من، نەعمان دەویست. من بۆ شتێك کەخۆیشت گرفتاری بوویت سەرکۆنە مەکە. دەمەوێت رقی من لەدڵ نەگریت چوونکە بەشی من لەم کارەدا زیاتر لەبەشی تۆ نییە. ئەوسوێندی بۆ کوڕی مەرینا خوارد کەهیچ کات خراپەی ئەوی ناوێت و خراپە لەو نالێت. کوڕی مەرینا هەستا و سوێندی خوارد بەردەوام لەئەندێشەی زیان گەیاندن بەو دەبێت و خراپەی ئەو دەڵێت. نەعمان هات و لەحیرە نیشتەجێ بوو. کوڕی مەرینا بەئەسوەدی وت: ئەگەر پاشایەتیت لەدەستدا، بێ خەم مەبە لەوەی دادی خۆت لەعودەی وەربگرێت چوونکە مەعدییەکان فریویان زۆرە کەهیچ کات دانامرکێنەوە. شتێکم بەتۆ وت کەفەرمانت نەبرد، ئێستا دەمەوێت هەر سامانێکیان بۆ هێنایت بەمنی بڵێیت. ئەسوەد رازی بوو.

کوڕی مەرینا زۆر دەوڵەمەند و هیچ رۆژێك نەبوو مەگەر ئەوەی دیاری و خەلآتی بۆ نەعمان دەنارد. لەم رێگاوە بووە رێزدارترین خەڵك لای ئەو. کاتێك باسی عودەی کوڕی زەید هاتەناو، وەسفی دەکرد بەلآم دەیوت بەداخەوە کەپیاوی فێڵ و فریوە. ئەو هاوەلآنی نەعمانی بۆ لای خۆ راکێشا و ئەوان پەیوەستی بوون. ئەو لەگەڵ ئەوان هاودەست و بەنەعمانیان وت: عودەی کوڕی زەید دەڵێت تۆ

بەڕێوەبەری کارەکانی ئەویت. بەردەوام لای نەعمان خراپەیان دەوت تا دڵی لێی پیس بوو. نەعمان داوای لەعودەی کوڕی زەید کرد سەردانی بکات. عودەی داوای مۆڵەتی لەنەعمان کرد تا بڕواتە سەردانی نەعمان و خوسرەو مۆڵەتیدا. کاتێك هاتە لای سەیری نەکرد و خستیە زیندان و مۆڵەتی بینینی پێنەدا. عودەی لەزیندان بەردەوام قسەی دەکرد. وتەکانی بەگوێی نەعمان گەشت و لەکارەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە بەڵام لەلایەکیتر لەئازاد کردنی دەترسا.

عودەی نامەی بۆ براکەی ئەبی نوسی و لە بارودۆخی خۆی ئاگاداری کردەوە. کاتێك نامەکەی خوێندەوە سەبارەت بەو لەگەڵ خوسرەو قسەی کرد. خوسرەو نامەی بۆ نەعمان نوسی و پیاوێکی نارد و فەرمانیدا عودەی ئازاد بکرێت. براکەی عودەی ڕۆشتە لای نێردراوی خوسرەو و تکای کرد پێش ڕۆشتنە لای نەعمان بڕواتە لای براکەی لەزیندان. ئەو ئەم کارەی کرد و لەزیندان ڕۆشتە لای عودەی و وتی خوسرەو شای شاکانی ئێران ناردویەتی و فەرمانی ئازاد کردنی تۆی دەرکردووە. عودەی پێی وت: لای من مرۆ و نامەکەی خوسرەو بەمن بدە تا بینێرم بۆ نەعمان چوونکە ئەگەر تۆ لای من بڕۆیتە دەر، دەمکوژێت. نێردراو گوێی لەقسەکانی نەگرت. دوژمنانی عودەی هاتنە لای نەعمان و ئەم هەواڵەیان پێراگەیاند و ئەویان لەئازاد کردنی عودەی ترساند. ئەو چەند پیاوێکی نارد کەعودەیان خنکاند و بەخاکیان سپارد. نێردراو هاتە لای نەعمان و نامەکەی پێدا. نەعمان وتی: فەرمانبردارم کەنامەیەکی بەرێزە. ئەو بۆ نێردراوەکە کەنیزێکی لەگەڵ چوار هەزار مسقاڵ زێر نارد و پەیامی دا: بەیانی لەزیندان برۆ لای و ئەو لەگەڵ خۆت ببە. نێردراو بەیانی ڕۆشتە زیندان بەڵام هیچ نیشانێکی لەعودەی نەبینی. زیندانوان وتی: چەند ڕۆژێکە مردووە. نێردراو گەڕایەوە لای نەعمان و وتی دوێنێکە عودەی بینیوە بەڵام ئەمڕۆ هیچ نیشانێکی لێ بەدەست نەهێناوە. نەعمان وتی: تۆ درۆ دەکەیت. ئەو بەرتیلی زیاتری پێدا و پەیمانی لێوەرگرت ڕاستی ڕوداوەکە بەخوسرەو نەڵێت بەڵکو بڵێت عودەی پێش گەشتنی ئەو مردووە. دەڵێن: نەعمان لەکوشتنی ئەو پەشیمان بوویەوە و دوژمنانی عودەی بەسەر نەعماندا زاڵ بوون و ترسی ئەوانی کەوتە دڵەوە. ڕۆژێك نەعمان بۆ ڕاو ڕۆشتەدەر ویەکێك لەکورەکانی عودەی

بەناوی زەیدی بینی. قسەی لەگەڵ کرد و لەبینینی زیاد لەرادە شامان و بۆ باوکی داوای لێخۆشبوونی کرد و ناردی بۆ لای خوسرەو شای شاکانی ئێران و نامەی نوسی و لەنامەکەدا وەسفی زەیدی کرد و داوای کرد پێگەی باوکی بەزەید بدرێت. خوسرەو ئەوکارەی کرد. زەید بووە سەرپەرەستی دەبیرخانە کەلەوێوە نامە بۆ عەرەبەکان دەنێردرا. خوسرەو پرسیاری نەعمانی لێکرد و زەید بەباشی وەڵامی دایەوە و بۆ چەندین ساڵ لەپێگەی باوکی لای خوسرەو مایەوە. ئەو زۆر دەرۆشتە لای خوسرەو.

پاشاکانی ئێران نوسراوێکیان بوو کە تیایدا ئاماژەیان بەژنانی دڵخوازی خۆیان دەدا. ئەوان کەسیان بۆ دۆزینەوە ئەم ژنانە بەو تایبەتمەندیانە دەنارد بەڵام ژنی عەرەبیان نەدەویست. زەید بەخوسرەوی وت: من لای بەندەکەت نەعمان لەکچانی خۆی و کچانی مامی زیاتر لەبیست کچ دەناسم بەم تایبەتمەندیانە. دەڵێن: خوسرەو بۆ نەعمان سەبارەت بەم ژنانە نامەی نوسی. زەید بەخوسرەوی وت: ئەی پاشا، خراپترین تایبەتمەندی عەرەب و نەعمان ئەوەیە خۆیان لەناعەرەبەکان بەگەورەتر دەزانن. دەترسم لەخۆبایی بوونی ئەم ژنانە ببزوێنێت. ئەگەر من بڕۆمە لای نەعمان ناتوانێت ملکەچی فەرمانی من نەبێت. من بنێرە لەگەڵ پیاوێك کەعەرەبی بزانێت. خوسرەو پیاوێکی چالاك و وشیاری لەگەڵدا نارد. ئەو دووانە بەرێکەوتن تا گەشتنە حیرە و ڕۆشتنە لای نەعمان. زەید پێی وت: پاشا بۆ کەسان و کورانی خۆی ژنی دەوێت. ئەو ویستی ڕێز لەتۆ بگرێت و لەبەر ئەمە منی بۆ لای تۆ نارد. نەعمان وتی: ئەم ژنانە چۆن بن؟ زەید وتی: ئەمە تایبەتمەندی ئەوانە کەهێناوە.

داستانی تایبەتمەندی ژنان بەم شێوە بوو کەمونزەر کەنیزێکی بۆ ئەنەوشیروان نارد کە لەکاتی هێرش کردنە سەر حارس کوڕی باوکی شەمیری غەسانی گرتبووی. ئەو تایبەتمەندییەکانی کەنیزەکەی بەم شێوە بۆ خوسرەو نوسی: ژنێکە باڵا نێوەنج، ڕەنگی ڕۆشن و ددانی پاك و سپی، پێستی سپی، مژۆڵی درێژ، دەموشاوە وەك مانگ، چاورەش، چاوگەورە، چاوکراوە وەك ئاسك، لوتی بەرز و باریك بەشێوەیەك ناوەڕاستەکەی کەمێك بەرزبووبێتەوە و کونەکانی تەسك و شێوەیەکی جوان، خەرامان، برۆی درێژ و گێراو، چاوجوان، کۆڵمی هەڵاوساو، ئەندامێکی ڕێك، قژی

ڕەش و درێژ و پڕ و پەخشان، گەردنێك بەو ئەندازە كێشراو كەگوارەكان بەر شانی نەكەوێت، سینە پان، مەمكی قوت، بازوو و شانی خڕ و بەرز، مەچەكی جوان، دەستی نەرم و ناسك، پەنجەی درێژ، ئەندامێكی ڕێك و جوان، سكی ناسك و بەپشت چەسپاو، كەمەری باریك، سمتی بەرز و قوت، ڕانی نەرم و پڕ گۆشت و سپی ، ماسولكەی تەر و تازە، شانی گەورە، ئەژنۆی گەورە، قولاپەی پڕ، جێگەی پاوانە تێر لەماسولكە، سمتی خڕ و بلورین، خەرامان، چاوانی خەوالوو، جلی ناسك، گوێرایەڵی قسەی هاوسەر، نە پێستی مەیلەو شین نەرەنگی ڕوی لەرەش، دەستەمۆ لەبەرابەر هاوسەر، سەنگین و دڵرەق لەبەرابەر بێگانە، لەهەژاریدا گەورە نەبووە، سەرحاڵ و زیندوو، ئارام و دڵپاك، خەزم وكەس و كاری ڕێزدار، كاتێك باسی نەژادی خۆی دەكات بەباوك بەسەندە دەكات نەبنەماڵە و بەبنەماڵە بەسەندە دەكات نە بەگەورەكان و خەڵكان، كارەكان بەفرمزانییەوە ئەنجام دەدات، ئەندێشەی ئەندێشەی گەورەكانە و كاری كاری نیازمەندان، دەستی داهێنەر، زمانی كورت، دەنگێكی ئارم و هێدی، ماڵ دەرازێنێتەوە و پشت دەكاتە دوژمنان، ئەگەر ڕوی تێبكەیت چێژ لەژیان دەبەیت و ئەگەر دەستی لێ هەڵگریت بەوە بەسەندە دەكات كەچاوەكانی داخات، كوڵمەكانی سور و لێوەكانی لەتینویەتی تۆ بلەرزێت. هەرئەوەندەی تۆ بەخوازیار ببینێت خۆی دەخاتە باوەشت و تا فەرمان لەتۆ وەرنەگرێت دانانیشێت.

خوسرەو بەمە ڕازی و فەرمانیدا ئەم تایبەتمەندییانە بنوسن.

ئەم نوسراوە تا ڕۆژگاری خوسرەو كوڕی هورموز مایەوە. زەید ئەم تایبەتمەندییانەی بۆ نەعمان خوێندەوە. ئەم وتارە لای ئەو گران كەوت. بەزەید و نێردراوی وت: ئایا لەنێوان چاوكراوەكانی سودای عێراق و ئێران ئەوەندە ژن دەستناكەوێت بەسەندەی ئێوە بكات؟ نێردراو بەزەیدی وت: چاو كراوە چی بێت؟ وتی: مانگا. نێردراو عەرەبی نەدەزانی و زەید بۆ تۆڵەسەندنەوە گەمەی بەوشەكان دەكرد.

نەعمان ئەو دووانەی ناردەوە و بۆ خوسرەوی نوسی: ئەوەی دەتەوێت لای من دەست ناكەوێت و بەزەیدی وت: لەمن خۆشبە.

كاتێك ئەو دووانە بۆ لای خوسرەو گەڕانەوە، بەزەیدی وت: كوا ئەو جوانە بێ

هاوتایانەی بۆمنت وەسف دەکرد؟ زەید وتی: من پێشتر بەپاشام وت عەرەبەکان ژنەکانیان لەکەسانیتر دریغ دەکەن و ئەمە لەبەر بەدبەختی و سەرسەختی ئەوانە. لەم نێردراوە بپرسە لەوەلامی داواکارییەکەی تۆی چی وت چوونکە من شا لەوە بەرێزدارتردەزانم بتوانم ئەم وتانە بێنمە سەر زمان. خوسرەو لەنێردراوی پرسی و ئەو وتی نەعمان دەڵێت: مێچکە گاکانی سوادی عێراق و ئێران بەسەندەی ئێوە ناکات کەچاوتان بڕیوەتە ژنانی ئێمە. زەید تورەیی لەچاوی پاشا خوێندەوە. ئەم وتەی کاریگەری لەسەر پاشا دانا و وتی: چ زۆرن ئەو بەندانەی لەمە خراپتر بەسەر خۆیان دێنن و خۆیان لەناو دەبەن.

ئەم وتەیە بەگوێی نەعمان گەشت و خوسرەو چەند مانگێك گوێی لێخەواند. نەعمان لەم ماوەدا سەرقاڵی ئامادە کردنی خۆی بوو. سەرئەنجام نامەی خوسرەو هات و نەعمانی بانگ کرد. کاتێك نامە گەشت کەرەستە و ئامرازی شەڕ و توێشوی هەلگرت و رویکردە دوو کوێستانی تەی چوونکە لەخەلکانی ئەوێ هاوسەری گرتبوو. داوای لەوان کرد پەنای بدەن و لەبەرابەر دوژمن هاوکاری بکەن. ئەوان لەترسی خوسرەو پەنایان نەدا. ئەو دەرۆشت و هیچ کام لەعەرەبەکان پەنایان نەدا. سەرئەنجام بەشێوەیەکی نهێنی لەدەشتی  زی قار لەناو کورانی شەیبان دابەزی. لێرە چاوی بە هانی کوڕی مەسعود کوڕی عامر کوڕی عەمرۆ شەیبان کەوت و ئەو سەروەرێکی مەزن و پارێزگاری لەپەنابەرانی خۆی دەکرد. بنەماڵەی ئەو لەبنەماڵەی زوجەدیس لەقەیس کوڕی مەسعود کوڕی قەیس کوڕی خالد کوڕی زوجەدین بوو کەخوسرەو ئۆبۆلەی پێبەخشیبوون. نەعمان لەسەر ئەم بنەمایە رازی بوو خۆی و بنەماڵەکەی بەو بسپێرێت. ئەو زانی هانی هاوشێوەی منالەکانی خۆی پارێزگاری لێدەکات. لەناو سامانەکانی ئەو چوارسەد و بەوتەیەك هەشسەد زرێ دەبینرا.

نەعمان بەرەو لای خوسرەو بەرێکەوت و زەید کوڕی عودەی لەسەر پردی سابات بینی. زەید وتی: ئەی نەعمان، خۆت رزگار بکە. نەعمان وتی: ئەی زەید ئەمە تۆ بوویت ئەم کارەت کرد. سوێند بەخوا ئەگەر رزگارم بێت بێ گومان ئەو بەلات بەسەردا دێنم کەبەسەر باوکت هێنام. زەید پێی وت: ئەی نەعمان خۆت رزگار بکە

چوونکە سوێند بەخوا لای ئەو داوێکم بۆناویتەوە کەئەسپی چالاك و بەهێزیش ناتوێنت لێی دەرباز بێت.

کاتێك خوسرەو بیستی نەعمان لەدەرگای بارەگایە، چەند کەسێکی نارد و قۆلبەستیان کرد و ڕەوانە خانەقینیان و زیندانییان کرد و بەهۆی نەخۆشی تاعونەوە مرد. خەڵك گومان دەکەن ئەو لەسابات مرد. ئەوان ئەم شێعرەی ئەشعی بە نمونە دەهێننەوە:

فذاك و ما انجى من الموت ربه        بساباط حتى مات و هو محرزق

واتاکەی: خواوەندەکەی لەمەرگ رزگاری نەکرد تا لەزیندان لەسابات مرد

مردنی ئەو پێش هەلاتنی هەتاوی ئیسلام بوو.

کاتێك مرد، خوسرەو ئەیاس کوڕی قەبیسەیی تایی لەسەر حیرە و پانتاییەکانی فەرمانڕەوایی نەعمان کردە فەرمانڕەوا. خوسرەو لەکاتی رۆشتن بۆ شەڕی رۆم لای ئەو گوزەری کرد و ئەو خەلات و دیاری بۆ ناردبوو. خوسرەویش سپاسی کرد. لەبەر ئەمە لەم کاتەدا کەسی نارد بەدوایدا. خوسرەو کەسی نارد وئەیاس فەرمانی بەقەبسیەدا سامانە پاشماوەکانی نەعمان کۆبکاتەوە و بۆی بنێرێت. ئەیاس بەقەبیسەدا کەسی بۆ لای هانی کوڕی مەسعودی شەیبانی نارد و فەرمانیدا سامانەکانی نەعمان بەو بسپێرێت. هانی رازی نەبوو، کاتێك هانی سەرپێچی کرد، خوسرەو تورە بوو. نەعمان کوڕی زەرعەی تەغلەبی کە خوازیاری لەناوچونی هیلال کوڕی بەکر کوڕی وایل بوو، لەم کاتە لای خوسرەو بوو. ئەو بەخوسرەوی وت: مۆڵەت بەوان بدە تا زستان پشت سەر بنێن و گرفتاری گەرمای هاوین بن و هاوشێوەی پەروانە کەدەکەوێتە ناو ئاگر، هێرش بکەنە زی قار و ئەوسا بەو شێوەی دەتەوێت دەست بەسەر ئەواندا دەگریت. خوسرەو درەنگی کرد تا ئەوان هاتنە خیزەلانە پێچاوپێچەکانی زی قار. ئەوسا نەعمان کوڕی زەرعەی کردە سەریان کەئەوانی لەسێ هەڵبژاردندا سەر پشك کرد: یا سامانەکانی نەعمان کوڕی مونزەر بەدەستی خۆیان بگێرنەوە، یا سەرزەمینەکەی خۆیان بەجێ بێڵن و کۆچ بکەن و یا بۆ شەڕ و کوژران ئامادە بن. ئەوان بەرێوبردنی کارەکانی فەرمانڕەوایەتی و فەرماندەیی خۆیان بەحەنزەلە کوڕی سەعلەبەی عیجلی سپارد. ئەو ئەوانی بۆ شەڕ

کردن هاندا. ئەوان پاشایان لەشەڕ کردن ئاگادار کردەوە. خوسرەو ئەیاس کوڕی قەبیسەی کردە فەرماندەی سوپا و سنوردارە ئێرانییەکانی کردە هاوڕێی و لەهۆزەکای عەرەب فەرمانی هاوکاری کردنی بەتەغلەب و ئەیاد و قەیس کوڕی مەسعود کوڕی قەیس کوڕی زی جەدینیدا. قەیس کوڕی مەسعود فەرمانڕەوایی قەراغەکانی سەفوان بوو، چەندین فیلی شەڕکەری نارد. لەم کاتەدا پێغەمبەر بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرابوو. لەم بگرە و بێنەدا هانی کوڕی مەسعود کەرەستەو ئامرازەکانی شەڕ و زرێکانی نەعمانی لەناو پیاوانی خۆی دابەش کرد.

کاتێك ئێرانییەکان لە ئاڵەکانی شەیبان نزیك بوونەوە، هانی کوڕی مەسعود وتی: ئەی دەستەی بەکرییەکان، ئێوە توانای خۆراگری لەبەردەم خوسرەوتان نییە، روو بکەنە بیابان و هەڵێن. خەڵك رویان کردە بیابان. حەنزەلە کوڕی سەعلەبەی عیجلی هەستا و وتی: ئەی هانی، دەتویست ئێمە رزگار بکەیت بەڵام ئێمەت لەناو برد. ئەو خەڵکی گەراندەوە و بەندی کەژاوەکانیان بڕی یانی ئەوبەندانەی بارو بنەیان لەسەر وشترەکان پێدەبەست و لەبەر ئەمە پێی دەڵێن (بەند پچڕێن). ئەوسا بۆ خۆی بارەگایەکی دروست کرد و سوێندی خوارد تا ئەم بارەگایە بەرپا بێت، رانەکات. خەڵك گەرانەوە و بەئەندازەی نیوەی مانگ ئاویان بۆ خۆیان پاشەکەوت کرد. لەم کاتەدا ئێرانییەکان هاتن و لەخەمینەی زی قار شەڕیان لەگەڵدا کردن. ئێرانییەکان شکستیان خوارد و لەترسی تینویەتی بەرەو جەبابات (حەمامات) رۆشتن. هۆزەکانی بەکر و عیجل شوێنیان کەوتن و بوێری زۆریان لەخۆیان نیشاندا. لەم کاتەدا سوپای ئێران گەمارۆیاندان و خەڵك وتیان: داخ بۆ هۆزی عیجل کەهەموویان لەناوچوون. دواتر هۆزی بەکر هێرشی کرد و بینی عیجلییەکان شەڕ دەکەن و ژنێك لەوان دەڵێت:

ان يظفروا فينا الغرل ... ايها فداء لكم بني عحل

واتاکەی:ئەگەر بەسەر ئێمەدا زاڵبن پێستی نێرینەی خۆیان تا بن لەئێمە دەچەقێنن. شەڕ بکەن فیدای ئێوە بن منداڵانی عیجل.

ئەوان سەراسەری ئەو رۆژە شەڕیان کرد و ئێرانییەکان لەتاو تینویەتی رویان لەناوەکانی زی قار کرد. ئەیادییەکان(کە لەبەرژەوەندی ئێرانییەکان شەڕیان دەکرد) پەیك و پەیامیان بۆ بەکرییەکان نارد و وتیان: ئەگەر دەتانەوێت ئەمشەو هەڵدێین و ئەگەر ناتانەوێت دەمێنینەوە تا شەڕ دەست پێدەکات و ئەوسا لەبەرژەوەندی ئێوە رادەکەین. وەڵامیان دایەوە: بمێننەوەو کاتێك شەڕ دەستی پێکرد هەڵبێن و گۆڕەپان چۆڵ بکەن. زەید کوڕی حەسانی سەکونی کە هاوپەیمانی مناڵەکانی شەیبان بوو، وتی: فەرمان ببیستن و سەنگەر بگرن. ئەم کارەیان کرد وشەڕیان کرد و یەکتریان بۆ ئەو شەڕ هاندەدا. لەم کاتەدا کچێکی خزمی شەیبانی دەیوت:

ویها بنی شیبان صفا بعد صف ان تهزموا یصبغوا فینا القلف

واتاکەی: درود لەمناڵەکانی شەیبان کەریز لەدوای ریز شەڕیان کرد. ئەگەر ئێوە شکست بخۆن ئەوان نێرینەی خۆیان بە خوێنی مێی ئێمە رەنگین دەکەن.

حەوسەد کەس لەمناڵەکانی شەیبان قۆلی کراسەکانیانی خۆیان لەجێگەی شانەکانەوە بڕی و فڕیاندا تا دەستیان بۆ شمشێر وەشاندن سوك بێت. ئەوان لەبەرابەر ئەوان شەڕێکی گەرمیان کرد و ئێرانییەکان پیاوەتی و جوامێری فراوانیان لەخۆیان نیشاندا. لەولا بەرد کوڕی حارسەی یەشکری هات و لەم لا هامرزنسوی. بەرد ئەوی کوشت. دواتر باڵی چەپ و راستی بەکرییەکان هێرشیان هێنا و ئەوانەی خۆیان حەشار دابوو لەحەشارەگەی خۆیان هاتنەدەر و هێرشیان کردە سەر ناوەراستی سوپا کەئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی فەرماندەیان بوو. لەم کاتەدا ئەیادییەکان بەو شێوەی بەڵێنیان دابوو، رایانکرد و ئێرانییەکان شکستیان خوارد و بەکرییەکان شوێنیان کەوتن. کوشتاریان کرد بەڵام تاڵانییان نەکرد. وتاردەران لەبارەی شەڕی زی قار ئاماژەیان بەگێرانەوەی زۆر داوە.

## پاشاکانی حیرە دوای عەمرۆ کوڕی هند

ئێمە ئاماژەمان بەپاشاکانی بنەماڵەی نەسر کوڕی رەبیعە تا مردنی عەمرۆ کوڕی هند دا. ئێستا درێژەی پاشاکانی ئەم بنەماڵە دوای عەمرۆ کوڕی هند:

براکەی قابووس کوڕی مونزەر چوار ساڵ کەهەشت مانگی لەرۆژگاری ئەنەوشیروان و سێ ساڵ و چوار مانگی لەرۆژگاری هورموز، سوهرەب، مونزەر کوڕی نەعمان چوار ساڵ، نەعمان کوڕی مونزەر باوکی قابوس بیست و دوو ساڵ کەحەوت ساڵ و هەشت مانگی لەرۆژگاری هورموز و چوارده ساڵ و چوار مانگی لەرۆژگاری کورەکەی پەرویز، ئەیاس کوڕی قەبیسی تایی هاورێ لەگەڵ نەخیرخان لەرۆژگاری خوسرەو کوڕی هورموز چواردەساڵ کە لەهەشتەمین مانگی فەرمانڕەوایەتی ئەو پێغەمبەر بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا، ئازاد کوڕی مابیان (ساسان) هەمەدانی حەفدە ساڵ کە لەرۆژگاری خوسرەو کوڕی هورموز چوارده ساڵ و هەشت مانگ و لەرۆژگاری شیرویە کوڕی خوسرەو هەشت مانگ و لەرۆژگاری ئەردەشیر کوڕی شیرویە یەك ساڵ و حەوت مانگ و لەرۆژگاری پورنەندۆخت کچی خوسرەو یەك مانگ.

دواتر مونزەر کوڕی نەعمان هاتە سەر کار. ئەو هەمان کەسە کەعەربەکان بە (لەخۆرازی) ناوی دەبەن و لەرۆژی شەڕی (جواثا) کوژرا. فەرمانڕەوایەتی ئەو تا هاتنی خالد کوڕی وەلید هەشت مانگی خایاند. ئەو دواهەمین پاشا لەبنەماڵەی نەسرە. بەنەمانی ئەو و روخانی پاشایەتی ئێران، فەرمانڕەوایی بنەماڵەکەیشی لەناوچوو. کەواتە، بە وتەی هشام، هەموو پاشاکانی بنەماڵەی نەسر بیست کەس بوون کەپێنسەد و بیست و دوو ساڵ و هەشت مانگ فەرمانڕەوایەتیان کرد.

## مەرزوان و فەرمانڕەوایەتی ئەو لەیەمەن لەلایەن هورموز

هشام دەڵێن: خوسرەو هورموز دوای لەسەر کار لابردنی زەرین لەیەمەن، مەرزوانی بۆ فەرمانڕەوایەتی ئەم سەرزەمینە دیاری کرد. تا ئەو کاتەی چەندین منالّی بۆ هاتە دنیا، لەیەمەن مایەوە. ئەوسا خەڵکانی کێوێك کەپێیان دەوت (مە ضایع) باجیان پێنەدا. مەبەستی ئەوانی کرد بەڵام بینی ناتوانێت بەسەر کێودا سەرکەوێت چوونکە زۆر بەرز و دژوارە و تەنیا یەك ڕێگەی هەیە کەیەك پیاو دەتوانێت پارێزگاری لێبکات. کێوێکیتر لەبەرابەر ئەم کێوەدا بوو. ئەسپی غاردا و لەدۆڵەکەی تێپەری و کاتێك حەمیرییەکان ئەویان بینی، وتیان: ئەمە دێوە! گەمارۆی خستە سەر قەڵاکەیان و باجی لێوەرگرتن. مەرزوان نامەی بۆ خوسرەو نوسی و ئەوی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. خوسرەو ئەوی بانگ کرد و کورەکەی خەرخسرەی لەجیاتی دانا. مەروزان روی کردە دەرباری خوسرەو و لەناو ڕێدا مرد. خوسرەو خەخسرەی لەسەر کار لابرد و بازانی لەجێگەی ئەو دانا. ئەو دوایین فەرمانڕەوایی یەمەن لەلایەن ئێرانییەکانەوە بوو.

## کوژرانی خوسرەو پەرویز

خوسرەو بەهۆی سامانی فراوان و داگیر کردنی زۆربەی وڵاتانی دوژمن و سازگاری چارەنوس و بەختی بەرز و زەمان، لەکۆتاییەکانی تەمەن بوو بەپاشایەکی یاخی و ستەمکار. تەماحکاری زەوت کردنی سامانی خەڵکان بوو، لەبەر ئەمە دژایەتی خەڵکان بزوا. دەستەیەك دەڵێن: ئەو دوانزە هەزار یا سێ هەزار ژنی بوو و لەگەڵیان دەخەوت. چەندین هزار کەنیز و پەنجا هەزار چوارپێ لەناو سامانەکانی ئەودا دەبینران، ئەو تەماحکارترینی خەڵکان بۆ کۆکردنەوەی جۆرەکانی گەوهەر و دەفر و هاوشێوەکانی بوو. دەڵێن: فەرمانیدا ئەو باجانەی لەماوەی هەژدە ساڵی فەرمانڕەوایەتی خۆی کۆیان کردبوویەوە بژمێرن و کاتێك ئەو کارەیان ەکرد، بەرابەر بوو لەگەڵ سەد هەزار هەزار و بیست هەزار هەزار(سەد و بیست ملیۆن) مسقاڵ سکەی زێر. خەڵکی سوك کرد و فەرمانی بەپیاوێك بەناوی زادان دا هەموو گرفتار و زیندانییەکان بکوژێت. زادان ئەو کارەی نەکرد و زیندانییەکان بوونە دوژمنی. هەروەها فەرمانیدا بوو تێکشکاوەکانی شەڕی رۆم بکوژن و ئەوانیش بوونە دوژمنی. ئەو فەرمانی بەپیاوێکدا پاشماوەی باج لەخەڵك وەربگرێت و ئەم پیاوە ستەمی فراوانی لەخەڵك کرد . خەڵکان لێی بێزار بوون. دەستەیەك لەگەورەکان رویان کردە بابل و شیرویەی کوڕیان هێنا. خوسرەو منداڵەکانی خۆی لەبابل دانابوو ونەوانی لەخۆتێهەڵقرتاندن لەکاروبارەکان دوورخستبوویەوە و چەندین کەسی راسپاردبوو فەرهەنگ وزانستی شایانەیان فێربکەن. شیرویە شەوانە گەشتە بەهرسیرو ئەوکەسانەی لەزیندان هێنایەدەر کەخوسرەو فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکردبوو. زیندانییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و هاواریان کرد قوباد شای شاکانە(ناوی ئەو لەسەرەتادا قوباد بوو) ئەوان هاتن و بەرەبەیان گەشتنە دەرباری خوسرەو و خوسرەو بەراکردن بەرەو باخێك لەنزیك کۆشکەکەی خۆی رۆشت. خەڵك ئەویان گرت و کورەکەیان هێنایە سەرتەخت. ئەو کەسی بۆلای کورەکەی نارد وسەرکۆنەی کرد کەبۆ بەم کارانە هەستاوە. دواتر خەڵك بەهاوکاری کورەکەی

کوشتیان. ڕۆژگاری پاشایەتی ئەو سی هەشت وساڵی خایاند.

لە سی و دوەمین ساڵ و پێنجەمە مانگ و پانزەهەمین ڕۆژی پاشایەتی ئەو پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد.

دەڵێن: خوسرەو هەژدە منالی بۆ هاتە دنیا کەگەورترینیان ناوی شەهریار بوو. شیرین ئەوی بەمنالی خۆی هەلگرتبوویەوە. ئەستێرەناسەکان بەخوسرەویان وتبوو لەیەکێك لەمناڵەکانی تۆ مناڵێك دێتەدنیا کەوێرانی و لەناوچوونی ئەم پاشایەتییە لەسەر دەستی ئەو دەبێت. نیشانەکەی ئەوەیە لەبەشێکی جەستەی کەم ئەندامە. ئەو مناڵەکانی خۆی لەخەوتن لەگەڵ ژنان دور کردەوە تا ئەوەی شەهریار لەدەردی گیانبڕی بێ ژنی گازندەی بردە لای شیرین. شیرین کەنیزێکی بوو کەخزمەتی دەکرد و گومانی دەکرد ئەو هیچ کات دووگیان نابێت. ئەو کەنیزی بۆ لای شەهریار نارد. کاتێك شەهریار لەگەڵی خەوت، بەیەزدگێرد دووگیان بوو. شیرین بۆ ماوەی پێنج ساڵ ئەوی داشارد. ئەوسا بینی خوسرەو لە هەرەتی پیری خوازیاری منالی مناڵەکانیەتی. پێی وت: ئایا شادمان دەبیت یەکێك لەمنالی مناڵەکانت کور بێت؟ وتی: بەڵێ. شیرین یەزدگێردی بردە لای. ئەو یەزدگێردی لەخۆی نزیك کردەوە. ڕۆژێك لەکاتی گەمە ئەوەی وترابوو، بیری کەوتەوە و فەرمانیدا یەزدگێردیان ڕوت کردەوە. ئەو عەیبی لەلایەکی کەلەکەی بینی و ویستی بیکوژێت. بەلام شیرین ڕێگەی لێگرت و وتی: ئەگەر چارەنوسی پاشایەتی ئەمە بێت ناتوانین ڕیگری لێ بکەین. شیرین فەرمانیدا یەزدگێردیان بۆ سیستان برد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبوو بەڵکو فەرمانیدا ئەو لەدێهاتێك لەسواد بەناوی خەمانینە ڕابگرن. کاتێك خوسرەو پەرویز کوڕی هورموز کوژرا، کورەکەی شیرویە بەپاشایەتی گەشت.

## پاشایەتی خوسرەو شیرویە
## کوڕی پەرویز کوڕی هورموز کوڕی ئەنەوشیروان

کاتێك شیرویە کوڕی پەرویز کەدایکی مریەم کچی موریس پاشای ڕۆم بوو، بەپاشایەتی گەشت، گەورەکان و دەرباریان هاتنە لای و وتیان: ڕەوا نییە ئێمە دوو پاشامان هەبێت. یا خوسرەو بکوژە تابەندەی تۆ بین و یا ئەو دێنینە سەر تەخت و تۆ لەسەر کار لادەبەین. شیرویە تێکشکا و باوکی لەپایتەخت هەڵگرت و بردیە شوێنێکیتر و زیندانی کرد. ئەوسا گەورەکان کۆبوونەوە و وتیان: بریارماندا کەسێك بۆ لای خوسرەو بنێرین و کارەخراپەکانی بیربخەینەوە و لەدواهاتی کارە نارەواکانی ئاگاداری بکەینەوە. شیرویە پیاوێکی بەناوی ئوستادی خۆشنوسی ناردە لای خوسرەو و فەرمانیدا لەزمانی ئەو بەباوك بڵێت: خراپەکاری و ستەمکاری ئەم بەڵای بەسەردا هێنای. یەك ئەوەی چاوی باوکت کوێر کرد و دواتر کوشتت. ئەویتر هەڵس و کەوتی خراپت لەگەڵ منداڵەکانت بوو کە لەهاونشینی لەگەڵ خەڵك دوورت کردینەوە و ئەوەی هۆکاری خۆشی ئێمە بوو لەئێمەت زەوت کرد. دواتر خەڵکانت دەخستە زیندانی هەمیشەیی. لەگەڵ ژنان خراپ هەڵس و کەوتت دەکرد و هەموویانت بۆ خۆت دەویست. دڵرەقی و ستەمکاری و بێ بەزەییت بەرامبەر بەچینەکانی ژێردەست یەکێکیتر لەهۆکارەکان بوو. سامان ودارایییەکانی خەڵکت بەزۆر لەخاوەنەکانی داگیر دەکرد. لەشکرت بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ سنورەکانی ڕۆم و شوێنەکانیتر نارد و ئەوانت لەبنەماڵەکانیان دوور خستەوە. خیانەتت لەمۆریس، پاشای ڕۆم کرد لەکاتێکدا چاکەی لەگەڵ تۆدا کرد و کچەکەی کردە هاوسەری تۆ بەڵام بەپێچەوانەوە ئەو دارەی نەخۆت و نەخەڵکەکەت پێویستیان پێی نەبوو، لەوان درێغ کرد. ئەگەر پاساوت بۆ کارەکانی خۆت هەیە و یا دەتەوێت داوای لێبووردن بکەیت، بیڵێ. ئەگەر نیتە بۆ لای خوا بگەرێرەوە تا فەرمانی خۆی لەبارەی تۆوە بدات.

دەڵێت: پەیك هات و پەیامی گەیاند و خوسرەو پەرویز وتی: لە لایەن منەوە بەشیرویەی تەمەن کورت بڵێ بۆ کەس شیاو نییە جگە لەدڵنیابوون لەتاوانەکانی

خۆی تۆبە و داوای لێخۆشبوون بکات چ بگات بەگوناحە گەورەکان و .. ئەوانەی تۆ ئێمەی پێ تۆمەتبار دەکەیت. ئەی نەزان، ئەگەر ئێمە بەم شێوە بووین کە تۆ دەڵێیت، بۆ تۆ ڕەوا نییە ئەم تاوانە گەورانە کەدەبێتە هۆکاری کوشتنی ئێمە، بەزیانی خۆت لەدنیادا بڵاوبکەیتەوە چوونکە ئەم کەمی و کوڕیانە پێش هەرکەسێك داوێنی خۆت دەگرێت. داوەرانی وڵاتی تۆ کوڕێك کەشیاوی کوشتن لەلایەن باوکەوە بێت، لەوڵات و خەڵکەکەی خۆیان دوور دەکەنەوە و لەهاودەمی و هاونشینی لەگەڵ گەورەکان چ بگات بەوەی بیکەنە پاشا. لەگەڵ ئەمانەیشدا، (سپاس بۆ خوا) ئەوەندە بۆ چاکسازی لەخۆمان و کورەکانمان و خەڵکان هەوڵمانداوە کە کەم و کوڕی تیا نابینرێت. هەنووکە داستانی تاوانەکانی خۆمان بە بەربڵاوی دەگێرینەوە تا زانستی تۆ بەنەزانی زیاد بکات. یەك لەوەڵامەکانی ئێمە ئەوەیە: خراپەکاران و دڵرەشان، ئەوەندە دەنەی باوکی ئێمە خوسرەوی هورموزیان دا و تاوانی خیانەتیان خستە پاڵمان کەمەبەستی گیانی منی کرد. لەبەر ئەوەی کە لەرەشبینی ئەو شتی زۆرمان بینیبوو، ترساین و لە دەربار خۆمان دوور خستەوەە و ڕۆشتین بۆ ئازەربایجان. هەمووان ئەم راستییە دەزانن. کاتێك پەردەی بەختی ئێمە بەو شێوەی دەزانن دڕا، دوبارە ڕومان کردە دەرگای باوکم. لەم کاتەدا بوو ئەو پیاوە دووڕووە یانی بەهرام هێرشی کردە سەرمان و ئێمەی لەوڵاتەکەمان دور خستەوە. ئێمە ڕومان کردە ڕۆم و دوبارە گەراینەوە بۆ سەر پاشایەتی خۆمان و تاوانی خوێنی باوکمان لەبکوژەکانی گرتەوە.

بەڵام ئەوەی سەبارەت بەهەڵس و کەوتی ئێمە لەگەڵ منداڵەکانمان باست کرد، وەڵامەکەی ئەوەیە: ئێمە چەندین کەسمان بۆ ئێوە دانا تا ئێوە لەبڵاوبوونەوە لەوڵات و ئەنجامدانی کارە نەشیاوەکان بگێرێتەوە بۆ ئەوەی خەڵك و وڵات هەردووك زیانمەند نەبن. لەمبارەوە ئێمە خەرجی زۆرمان کرد و ئەوەی نیازتان بوو، خستمانە بەردەستتان. بەتایبەت لەبارەی تۆ، ئەستێرەناسەکان بەئێمەیان وت کەدزی ئێمە رادەپەریت و پاشایەتی لەئێمە دەسەنێت. پاشای هیندوستان نامەی بۆ تۆنووسی و دیاری بۆ ناردی. ئێمە نامەکەمان خوێندەوە و بینیمان دوای سی و هەشت ساڵ لەپاشایەتی ئێمە، مژدەی پاشایەتی بەتۆ دەدات. نامەکەمان هەڵگرت و ڕۆژی لەدایك

بوونی تۆمان نوسی و هەردووکیمان بەشیرین سپارد و هەنوکەیش لای ئەوە. ئەگەر دەتەوێت وەریگرە و بیخوێنەرەوە. ئەم کارانە نەبووە هۆی ئەوەی ئێمە باشی و چاکی خۆمان لەتۆ وەربگرینەوە چ بگات بەوەی تۆ بکوژین.

بەلاّم ئەوەی سەبارەت بەزیندانی کردنی کەسەکان ئاماژەت پێدابوو، وەلاّمی ئێمە ئەوەیە: ئەوانەمان خستە زیندان کەدەبوا یا بکوژرێن یا دەست و قاچ یا ئەندامێکیتریان ببردرێتەوە. وەزیریان و کاربەدەستان بەردەوام بۆ کوشتنی ئەوان ئێمەیان هاندەدا و رێگەیان نەدەدا ئەوان بۆ خۆیان چارەیەك بدۆزنەوە. ئێمە بەهۆی خۆشویستنی خەڵکان و بێزاربوون لەرشتنی خوێنی ئەوان، کارەکانی ئەوانمان دوادەخست و چارەنوسی ئەوانمان بەخوای گەورە دەسپارد. ئێستا ئەگەر تۆ ئەوانت لەزیندان دەرهێناوە. گوناحی خواوەندی خۆت کردووە و تامەکەی دەچێژیت.

بەلاّم ئەوەی دەڵێیت ئێمە زێر و زیوی و کالاّ گرانباییەکان بەستەمکاری و بێ بەزەییانە زەوت دەکەین، وەلاّم ئەمەیە: بزانە ئەی نەزان، دوای خوای گەورە تەنیا سوپای زۆر و دارایی بێ ئەژمارە کەپاشایەتی بەهێز دەکات. بەتایبەت ئەم وتارە بۆ ئێران زەمین راستە کەدوژمنەکان لەهەر لاوە دەوریان داوە و دورخستنەوەی ئەوان بەبێ سوپای زۆر و کەرەستەکانی شەڕ ئەگەری نابێت و هەمووی ئەمانە بەزێر و زیو دابین دەکرێت. پێشینان دارایی و کەرەستەکانی شەڕ و شتی هاوشێوەیان کۆکردبوویەوە بەلاّم ئەو پیاوە دوورووە یانی بەهرام تالاّنی کرد و جگە لەکەمێکی نەهێشتەوە. کاتێك دووبارە پاشایەتی خۆمان وەرگرتەوە و جەماوەری خەڵك فەرمانیان لێ بردین، دوو کامروسان(پادوسپان) و دو سوپا سالاّرمان بۆ بەشە جۆراوجۆرەکانی ولاّت نارد تا زیانی خراپە خوازان و دوژمنان دور بکەنەوە و هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی ئەوان و رەگ و ریشەی خراپەیان دەرهێنا. خەزێنەکانی زێر و زیوی ئەوانیان بەسامانە فراوانەکان لەهەر جۆرە کالاّیەك بەو ئەندازەی جگە لەخوا نازانێت، بۆ ئێمە هێنا. هەواڵمان پێگەشتووە دەتەوێت ئەم هەموو سامانە لەناو خراپەکاراندا دابەش بکەیت کەشیاوی کوشتنن. ئاگادارت دەکەمەوە ئەم سامانە بەرەنج و هەوڵی زۆر و بەتەخت کردنی رێگەی زیان و ترسی گیان بەدەست هاتووە. ئەم کارە مەکە چوونکە ئەم سامانە پاڵپشتی ولاّت و پاشایەتی

تۆیە و هێزێکە بوو دورکردنەوەی نەیاران. کاتێك نوستادی خۆشنوس بۆ لای شیرویە گەڕایەوە، وەڵامەکانی باوکی پێوت. ئەوسا گەورەکانی ئێران رویان کردە شیرویە و وتیان: یا فەرمان بدە باوکت بکوژن یا دەڕۆینە ژێر فەرمانی ئەو و تۆ لەسەر کار لادەبەین. ئەو بەنارەزامەندییەوە فەرمانی کوشتنی باوکی دا و کەسێکی بۆ ئەم کارە راسپارد کەخوسرەو پەرویز ئازاریدابوو. ئەوەی بەدەستی خۆی کوشتی، گەنجێك بەناوی مێهرهورموز کوڕی مەردانشا لەدەشتی (نیمروز)بوو.

کاتێك خوسرەو پەرویز کوژرا، شیرویە سەروچاوی خۆی ڕنی و فرمێسکی لەچاوباراند. پەیکەری ئەویان هەلگرت وگەورەکانی ولأت تا ئارامگاکەی لەگەڵی رۆشتن. کاتێك بەخاك سپێردرا، شیرویە فەرمانی دا مێهرهورموز بکوژن. رۆژگاری پاشایەتی ئەو سی و هەشت ساڵی خایاند.

دواتر شیرویە بە لەناوبردنی براکانی هەستا و حەفدە لەوانی کوشت. هەموویان پیاوانێکی ئازا و فرەزان بوون. ئەم کارەی بە ئاژاوە گێری فیروزی وەزیر ئەنجامدا.

زۆری نەخایاند شیرویە گرفتاری نەخۆشیە جۆراوجۆرەکان بوو و خۆشی لەدنیا نەبینی. مەرگی ئەو لەدەستگردی پایتەخت روویدا. ئەو دوای کوشتنی براکانی گرفتاری خەمۆکی بوو و ئارم و ئۆقرەی لێبرا. دەڵێن رۆژی دوەمی کوشتنی براکانی پوران و ئازەرمیدۆخت رۆشتنە لای و بەتوندی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کرد و وتیان: تەماح بۆ راگرتنی تاج و تەختی سەڵتەنەتی لەرزان، تۆی ناچار بەکوشتنی باوك و براکانت کرد. کاتێك ئەم قسانەی بیست گریا و تاجی لەسەر فڕێدا. دەڵێن: زۆربەی کەسانی بنەماڵەکەی کوشت. لەرۆژگاری ئەو تاعون کەوتە ئێران و زۆربەی ئەوانی لەناوبرد. رۆژگاری پاشایەتی ئەو هەشت مانگی خایاند.

## پاشایەتی ئەردەشیر

حەوت ساڵە بوو کە وەك پاشا هەڵبژێردرا.

کاتێك شیرویە مرد، ئێرانییەکان کوڕەکەی شیرویەیان بۆ پاشایەتی هەڵبژارد. پەروەردە و سەرپەرەستی کردنی ئەو لەئەستۆی پیاوێك بەناوی بەهادۆر جۆسنس بوو. پێگەی ئەم پیاوە (خانسالار)بوو. ئەو زۆر بەباشی کاروباری هەڵدەسوراند و لەرێگەی ئەم ولأتداریە عاقلأنەوە کارێکی کرد کەس پاشا بەبچوك و کەم تەمەن نەزانێت. شەهر بەراز و ئەو سوپایەی خوسرەو پەرویز خستبوویە ژێرفەرمانی، لەسنوورەکانی رۆم مابوونەوە. دوای ئەو کارەی لەگەڵ رۆمیەکان کرد، بارودۆخی باشی بۆ رەخسا. کالأ و دیاری کەم وێنەی بۆ دەربار دەنارد و پەروزی و شیرویە نامەیان بۆ دەنوسی و راوێژیان لەگەڵ دەکرد. بەلأم ئێرانییەکان بۆ هێنانەسەر کاری ئەردەشیر راوێژیان لەگەڵ نەکرد و ئەم پێشهاتەی کردە بیانوێك بۆ چاوبرینە دەسەلأت و سوك کردنی ئەردەشیر پاشای بچوك و کەم تەمەن. لەخۆبایی بوونی ئەو زیادی کرد. لەگەڵ سوپاکەی رویکردە مەداین. ئەردەشیر و بەهادۆر جۆسنس و ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی رویان کردە تیسفون. شەهربەراز لەم شارە گەمارۆیدان و ئاگر هاوێژی بەکار برد و ئەوانی ئاگر باران و بەردباران کرد بەلأم سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. لەبەر ئەمە پشتی بەفێڵ و فریو بەست و سوپاسالار نیمروز و فەرماندەی پاسەوانانی شاری هەڵخەڵەتاند و سەرئەنجام دەروازەی شاریان بۆ کردەوە. هاتە ناو شارەکە و ژمارەیەك لەگەورەکانی کوشت و سامانی ئەوانی تالأن کرد. یەك لەهاوەلأنی ئەو بەفەرمانی ئەو ئەردەشیری لەهەیوانی خوسرەوشا قوباد کوشت. رۆژگاری پاشایەتی ئەو یەك ساڵ و شەش مانگی خایاند.

## پاشایەتی شەهەربەراز

ئەو لەبنەماڵەی پاشایەتی نەبوو.

کاتێك ئەردەشیر کوژرا، شەهر بەراز کەناوی (فەرۆخان)بوو، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. کاتێك هاتەسەر تەخت، ژانە سکێکی گیانبڕی گرت بەڵام پاش ماوەیەك باش بوویەوە.

لەم ناوەدا سێ برا لەخەڵکانی ئیستەخر بڕیاریاندا لەتۆڵەی خوێنی ئەردەشیر، بیکوژن. ئەوان لەناو پاسەوانەکانی ئەودا دەبینران. ئایینی دەرباری لەوکاتەدا بەشێوەیەك بوو پاسەوانەکان لەدوو ریزدا دەوەستان و ئامرازی شەڕ و شمشێر و رمیان هەڵدەگرت. کاتێك پاشا لایانەوە تێدەپەری یەك یەك سەریان دادەنەواند و هاوشێوەی نوێژخوێنان سەریان لەقەڵغانەکانیان دەدا و بەمشێوەیە رێزیان لەپاشا دەگرت. رۆژێك شەهربەراز لەسەرئەسپەکەی خۆی دانیشت و سێ برا لای یەك وەستان. کاتێك شەهەربەراز گەشتە لای ئەوان، بەرم سینەیان کون کون کرد. ئەو کەوتە خوار و دەسبەجێ گیانی دا. بەتەناف قاچیان بەست و بەراکێشان بردیان و دەستەیەك لەگەورەکانی وڵات هاوکارییان کردن. تەمەنی پاشایەتی ئەو چل رۆژی خایاند.

## پاشایەتی پوران
## کچی پەرویز کوڕی هورموز کوڕی ئەنەوشیروان

کاتێك شەهربەراز کوژرا، ئێرانییەکان شازدەکچ، پورانیان هێنایە سەرتەخت چوونکە هیچ پیاوێك نەمابوو ئەو پێگەی پێببەخشن. کاتێك پوران لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، کردەوەی باشی لەگەڵ خەڵك گرتەبەر و دادپەروەرانە فەرمانرەوایەتی کرد. سەرلەنوێ پردەکانی دروست کردەوە، پاشماوەانی باجی وەرنەگرت و داری خاچی بۆ پاشای رۆم گەراندەوە. پاشایەتی ئەو یەك مانگ و چوار ساڵی خایاند. دوای ئەو پیاوێك بەناوی (خۆشنوش بەندە) لەئامۆزا دوورەکانی خوسرەو پەرویز هاتەسەر کار. سوپاییەکان ئەویان کوشت چوونکە هەڵس و کەوتی ئەویان بەدڵ نەبوو.

## پاشایەتی ئازەرمیدۆخت کچی پەرویز

کاتێك خۆشنوش بەندە کوژرا، ئێرانییەکان ئازەرمیدۆخت کچی پەروزییان بۆپاشایەتی هەڵبژارد. یەکێك لەجوانترین ژنانی جیهان بوو. فەرماندەی ئەرتەشی ئێران لەم کاتەدا پیاوێك بەناوی فەرۆخ هورموز سپاسالاری خوراسان بوو. ئەوکەسێکی بۆ خوازبێنی ئەم کچە نارد و کچ وەڵامی دایەوە: هاوسەر گرتن بۆ ئێمە رەوانییە. مەبەستی تۆ چێژ بردنە لەمن. کەواتە لەفلاَن کات وەرە لای من و لەئامێزم بگرە. ئەو هەوساری پچراند و لەو شەوە رۆشتە سەردانی شازدەکچی وڵات. کچ بەنهێنی فەرمانی بەفەرماندەی پاسەوانەکان دا بیکوژێت. ئەو فەرۆخ هورموزی کوشت و جەستەکەی فرێدایە گۆڕەپانی گەورەی پایتەخت. بۆ بەیانی خەڵك بەکوژراویان بینی و بەخاکیان سپارد. کورەکەی ئەو رۆستەمە کە لەقادسیە

لەبەرابەر موسوڵمانەکان خۆراگری کرد. ئەو جێگری باوکی بوو لەخوراسان. رۆستەم لەگەڵ سوپاکەی خۆی هاتە مەداین و چاوە جوانەکانی ئازەرمیدۆختی هەڵکۆڵی و کوێری کرد. هەندێك دەڵێن: ژەهر خواردی کرد. رۆژگاری پاشایەتی ئەو شەش مانگی خایاند. دەڵێن: لەم کاتەدا پیاوێك بەناوی خوسرەو کوڕی مێهر جۆسنس لەکورەزاکانی ئەردەشیری بابەکان کە لەئەهواز دەژیا، دەرکەوت و گەورەکانی وڵات ئەویان کردە پاشا و تاجیان لەسەر کرد. ئەو چەند رۆژ دوای پاشایەتییەکەی کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی دوای ئازەرمیدۆخت پاشایەتی گرتەدەست، خەرزاد خوسرەو لەکورەزاکانی خوسرەو پەرویز بوو. دایکی ئەو ژنێکی بەرەگەز کورد و خوشکی بەستام بوو. ئەویان لە(سەنگدژ) لای نەسیبین دۆزییەوە. ئەو چەند رۆژێك لەسەر تەخت مایەوە و دواتر ئەویان لەسەر کار لابرد. رۆژگاری پاشایەتی ئەو شەش مانگی خایاند.

ئەوانەی وتویانە خوسرەو مێهر کسنس پاشایەتی گرتەدەست، دەڵێن: کاتێك کوژرا، گەورەکان بەدوای کەسێك دەگەران بەرەگەز بگەرێتەوە سەربنەماڵەی پاشاکان، تەنانەت ئەگەر ژنیش بێت. لەم کاتەدا پیاوێك لەپاشماوەکانی میسانیان هێنا کەناوی فیروز کوڕی مێهران جۆسنس بوو و بە(جۆسنسەندە)(خۆشنوش بەندە) ناودەبرا و دایکی چواربەخت کچی یەزدان زان کوڕی ئەنەوشیروان بوو. ئێرانییەکان وەك پاشا هەڵیانبژارد. سەری گەورە بوو، کاتێك ویستی تاج لەسەر بکات وتی چ تەسکە ئەم تاجە! گەورەکان ئەم وتەیان بەشێوەیەکی خراپ لێکدایەوە و دەسبەجێ کوشتیان.. دەستەیەك دەڵێن: کوژرانی ئەو دوای چەند رۆژ بوو.

# پاشایەتی یەزدگێرد کوڕی شەهریار کوڕی پەرویز

لەم کاتەدا بارودۆخی ئێرانییەکان روی کردە بەدبەختی و چارەرەشی و موسوڵمانەکان هاتنە سەرزەمینی ئەوان. ئێرانییەکان بە دوای کەسێك لەبنەماڵەی پاشایەتی دەگەران تا بیکەنە پاشای خۆیان و لەژێر ئالآی ئەودا شەڕ بکەن و ولآتی خۆیان لەزیانی ئەنیران (نائێرانییەکان) دووربکەنەوە. ئەوان یەزدگێرد کوڕی شەهریاریان لەئیستەخر دۆزییەوە. ئەویان هەڵگرت و هێنایانە مەداین و لەسەر تەخت دایانیشاند.. بەڵآم فەرمانرەوایی ئەو لای کەسەکانی گوماناوی و وەزیرەکان کاروبارەکانیان بەڕێوەدەبرد چونکە بارودۆخی ئێران شێواو و شپرزە و پاشاکەیان کەم تەمەن بوو. دوژمنان لێیان راستبوونەوە و بارودۆخی ولآت بەتەواوی دژوار و ئەنیران (جیاواز لەئێرانییەکان) هاتنە ناو ولآتەکەیان. دوای دوو ساڵ لەپاشایەتی ئەو، عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر ئێران. هەموو رۆژگاری ئەو بیست و هەشت ساڵی خایاند. ئەو ناجوامێرانە کوژرا.

بەسەرهاتی ئەو لەکاتی نوسینی فتوحاتی ئیسلامی ئاماژە پێدەدەین.

ئەمە دوایین پاشای ئێران بوو. دوای ئەوە مێژووە ئیسلامیەکان بەپێی ساڵەکانی کۆچی باس دەکەین. پێشتر رۆژە ناودارەکانی عەرەب و شەڕەکانیان باس دەکەین. دواتر بەخواستی خوای گەورە ئاماژە بەرووداوەکانی رۆژگاری ئیسلام دەدەین.

## شەڕەکانی عەرەب لەڕۆژگاری نەزانیدا( جاهلی )

ئەبوجەعفەری تەبەری لەشەڕکانی ئەوان جگە لەڕۆژەکانی زی قار، جەزیمە ئەبرەش، زەبا، تەسم و جەدیسی بیرنەهێناوەتەوە. ئەوانیش تەنیا لەسەردەمی پاشایەتی ئەوان باس کردووە. ئەو بەسەرهاتەکانیتری پشت گوێ خستووە. ئێمە ڕۆژە ناودارەکان و ڕوداوە ناسراوەکان کە لەخۆگری ژمارەیەکی زۆری خەڵك و کوشت وکوشتاری فەراوان بووە، ئاماژە پێدەدەین. ئێمە باسی هێرش و شەڕ بچوکەکان ناکەین چوونکە ژمارەیان زۆر و لەبژاردن نایەن. ئێستا بەیاری خوا دەڵێین:

## شەڕی زوهەیر کوڕی جەنابی کەلبی لەگەڵ غەتفان و بەکر و تەغلەب و منداڵەکانی یەقین

زوهەیر کوڕی جەناب کوڕی هوبەل کوڕی عەبدوللە کوڕی کەنانە کوڕی عەوف کوڕی عوزرەی کەلبی یەك لەو کەسانە بوو کەخەڵکی هۆزی قوزاعە دەوریان گرت. ئەویان بەهۆی بە بەڕشتی لەبڕیار بەکاهین ناو دەبرد. ئەو دوو سەد و پەنجا ساڵ و بەوتەی هەندێ کەس چوارسەد و پەنجا ساڵ ژیا و دوو سەد جار ڕۆشتۆتە گۆڕەپانی شەڕ. پیاوێکی بوێر، سەرکەوتوو و کردەوە بەرز بوو.

هۆکاری شەڕ لەگەڵ غەتەفان ئەوەبوو کاتێك منداڵەکانی بەغیز کوڕی ریس کوڕی غەتەفان لەتەهامە هاتنەدەر، هەموویان بەرێکەوتن و لەم ناوەدا (سدا) کەلقێك لەهۆزی مەزحیج بوو، ڕوبەڕویان بوویەوە و رێگەی لێ گرتن. شەڕ لەنێوانیان رویدا و کورەکانی بەغیز هاورێ لەگەڵ ژن و منداڵ و سامانەکانی خۆیان بۆ پێشەوە دەرۆشتن. لەبەرابەر سدائییەکان بەرگریان لەخۆیان دەکرد. ئەوان بەسەر سدائیەکان سەرکەوتن و زۆر لەوانیان کوشت. لەم ڕووەوە بەغیزیەکان بەرێز و مەزن

بوون و سامانەکانیان زیادی کرد. کاتێك ئەمەیان بینی وتیان: سوێند بەخوا بێ گومان بارەگایەك وەك مەککە بۆ خۆمان دروست دەکەین کەراوچی نەکوژرێت و پەنابەرەکەی ئارام بێت و زیانی پێ نەگات. بۆ خۆیان بارەگایەکیان دروست کرد و منالەکانی مورە کوڕی عەوف سەرپەرەستی ئەوانیان گرتە دەست. کاتێك کردار و وتار و هاوپەیمانی ئەوان بەزوهەیر کوڕی جەناب گەشت، وتی: سوێند بەخوا تا من زیندووبم بەم کارە رازی نابم و هەرگێز رێگەنادەم غەتەفانییەکان بۆ خۆیان بارەگایەك دروست بکەن. ئەو لەناو خەڵکەکەی خۆی جاریدا و ئەوان کۆبوونەوە. لەناو ئەوان وتارێکی پێشکەش کرد و رۆژگار و کرداری غەتەفانییەکانی گێرایەوە و ئەوی بیستبووی، باسی کرد. وتی: گەورەترین هۆکاری شانازی کە من و ئێوە دەتوانین بۆ خۆمانی پاشەکەوت بکەین، ئەوەیە رێگەی ئەم کارە لەوان بگرین. خەڵکان وەڵامیان دایەوە و رەزامەندی خۆیان نیشاندا. هاورێ لەگەڵ ئەوان رۆشتە شەڕی غەتەفانییەکان و قورسترین و خوێناویترین شەڕەکانی دەستپێکرد. زوهەیر بەسەر ئەواندا زاڵ و دادی دڵی لەوان سەند و شاسوارێك لەوانی لەناو بارەگاکەیان گرت و کوشتی و ئەو بارەگای روخاند. ئەوسا غەتەفانییەکانی بەخشی و ژنەکانی دانەوە سامانەکانی پاراستن.

زوهەیر لەمبارەوە وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| فلم تصبر لنا غطفان لما | تلاقينا و احرزت النساء |
| فلولا الفضل منا ما رجعتم | الى عذراء شيمتها الحياء |
| فدونكم ديونا فاطلبووها | و اوتارا ودونكم اللقاء |
| فانا حيث لا يخفى عليكم | ليوث حين يحتضر اللواء |
| فقد اضحى لحى بنى جناب | فضاء الارض و الماء الرواء |
| نفينا نخوة الاعداء عنا | بارماح اسنتها ظماء |
| ولولا صبرنا يوم التقينا | لقينا مثل ما لقيت صداء |
| غداة تضرعوا لبني بغيض | وصدق الطعن للنوكى شفاء |

واتاکەی: کاتێك یەکمان بینی و ژنەکان لەبەندا گرفتار بوون، غەتەفانییەکان

لەبەردەم ئێمەدا خۆراگریان نەکرد. ئەگەر بەخشینەکانی ئێمە نەدەبوو، ئێوە ئیتر لەباوەشی کچێکی شەرمێوندا ئارامتان نەدەگرت. ئێستا قەرزەکانتان وەربگرنەوە و بە دوای خوێنە رژاوەکاندا برۆن و ئەگەر دەتوانن بیهێنن بۆ گۆرەپانی شەڕ. ئێمە لەوێین و بەو شێوەین کەلای ئێوە شاراوە نییە. کاتێك ئالا هەڵبکرێت، شێری ژیانین. ئێستا پانایی زەوی و ئاوی سازگار تایبەت بووە بەکورەکانی جەناب. ئێمە گەردن درێژی دوژمنانمان لەخۆمان دور کردەوە و ئەم کارەمان بەو ڕمانە کرد کەنوکەکانیان تینوی خوێنن. ئەگەر لەرۆژی شەڕ خۆراگریمان نەدەکرد، ئەوەمان بەسەردەهات کەبەسەر سدائییەکان هات. لەو بەرەبەیانە کەبەغیزیەکان دەگریان و دەپارانەوە. داکوتانی سازگار بە ڕم، باشتر کردنی نەزان و بێ ئاوزانە.

هۆکاری شەڕی ئەو لەگەڵ بەکر و تەغلەب منداڵەکانی وایل ئەوە بوو کاتێك ئەبرەهە گەشتە نەجد، زوهەیر رۆشتە لای. ئەو رێزی لێگرت و پێش عەرەبەکانیتری خست. دواتر ئەوی کردە فەرمانرەوایی بەکر و تەغلەب (دوو هۆز لەبنەماڵەی وایل). ئەو بووە فەرمانرەوایی ئەوان تا ساڵێکی وشك و دژوار گەشت کەدانی باجی دڵخواز لەسەر ئەوان گران تەواو بوو. زوهەیر شەڕی لەگەڵ کردن و لەوەرگاکانی لەوان سەندەوە تا باج و قەرزەکانی خۆیان بدەن. مردنی ئاژەڵەکانیان نزیك بوویەوە. کوڕی زیابە یەکێك لەمناڵەکانی تەیم الله کوڕی سەعلەبە کەشەرکەرێکی خوێنرێژ بوو، ئەمەی بینی و کاتێك زوهەیر نوستبوو، هاتەسەر سەری و شمشێری لەسکی چەقاند و قورسایی خۆی خستەسەری بەشێوەیەك کەشمشێر پێستی ژێرەوەیشی هەڵدڕی و نوکەکەی هاتەدەر و لەئەرز رۆچوو. سك و ریخۆڵەکانی بەسلامەتی مایەوە. تەمیمی گومانی کرد ئەوی کوشتووە و زوهەیر زانی تەندروست رزگاری بووە و لەبەر ئەمە بەدژواری خۆی گرت و نەجولا تا ئەو پیاوە خوێنرێژە هێرش نەکاتەسەری و بەیەکجاری خوێنی نەرێژێت. تەمیمی بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەرایەوە و ئاگاداری کردن کەزوهەیری کوشتووە.

هاورێیانی زوهەیر جگە لەکەمێك لەخەڵکەکەی نەبوون. فەرمانیدا بەرواڵەت مەرگی ئەو رابگەیەنن و لەبەکرییەکان و تەغلەبیەکان بۆ بەخاك سپاردنی مۆڵەت وەربگرن. کاتێك مۆڵەتیان وەرگرت، قوماشێك لەجیاتی ئەو بەخاك بسپێرن و ئەو

بۆ چارەسەر کردن بۆ لای خەڵکەکەی ببەن. ئەم کارەیان کرد. بەکرییەکان و تەغلەبییەکان مۆڵەتیان دا ئەو بەخاك بسپێرن. زەوییان هەڵکەند و لەقولاییدا رۆشتنە خوار و دواتر قوماشێکیان بەخاك سپارد کەهەر کەس بینی، وتی بێ گومان مردووێکە بە خاکی دەسپێرن. دواتر بەپەلە ئەویان بۆ لای خەڵکەکەی برد. زوهەیر سوپایەکی زۆری کۆکردەوە تا هێرش بکاتە سەریان. هەواڵەکەیان پێگەشت و کوڕی زیابە بەم شێوەی وت:

طعنة ما طعنت فة غلس اللي — ييل زهيرا و قد توافى الخصوم

حين يحمى لة المواسم بكر — اين بكر و ايم منها الحلوم

خانني السيف اذ طعنت زهيرا — وهو سيف مضلل مشئوم

واتاکەی: کاتێك دوژمنەکان بەیەك گەشتن، لەتاریکی شەو بەتوندی شمشێرێکم لەزوهەیردا. بەشێوەیەك بەکرییەکان مەرگی ئەویان جەژن گرت و ئاییی بەخاکسپاردنیان ئەنجامدا. ئێستا بەکرییەکان لەکوێن و ئامانجەکانیان بۆ کوێ رۆشت و چیبوو بە فیرۆ چوو؟ شمشێرەکەم خیانەتی لێکرد و کاتێك لەزوهەیرم دا دڵی کون نەکرد. شمشێر خوار و بەدبەختی بوو.

زوهەیر هەر کەسێکی توانی، لەیەمەن کۆیکردەوە و هاورێ لەگەڵ ئەوان رۆشتە شەڕی بەکر و تەغلەب. ئەوان زانیان و سەرسەختانە بەرگریان کرد. شەڕێکی قورسی لەگەڵ بەکردا کرد و ئەوانی تێکشکاند. دوای ئەوە لەگەڵ تەغلەب شەڕی کرد و ئەوانیش شکستیان خوارد. کولەیب و موهەلهیل دوو کورەکەی رەبیعە ئەسیر کران و سامانەکان دەستیان بەسەردا گیرا و کوژراوەکان لەتەغلەبیەکان زیادی کرد. ژمارەیەك لەشاسوارەکان و بوێران و گەورەکانیشیان ئەسیر کران. زوهەیر لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە کە ئەمە چەند دێرێکیەتی:

اين اين الفرار من الحذر المو — ت اذا يتقون بللاسلاب

اذ اسرنا مهلهلا و اخاه — و ابن عمرو فى القيدو ابن شهاب

و سبينا من تغلب كل بيضا — ء رقود الضحى برود الرضاب

| | |
|---|---|
| حين تدعو مهلهلا يال بكر | ها اهذی حفيظة الاحساب |
| و يحكم و يحكم ابيح حماكم | يا بنی تغلب انا ابن رضاب |
| وهم هاربوون فی كل فج | كشر يد النعام فوق الرو ابی |
| و استدارت رحی المنايا عليهم | بليوث من عامر و جناب |
| فهم بين ها رب ليس يألو | و قتيل معفر فی التراب |
| فضل العز عزنا حين نسمو | ثل فضل السماء فوق السحاب |

واتاکەی: شوێنی راکردن کوێیە؟ کوێیە؟ کاتێك ئەوان بەسەلەبەکان مەرگیان لەخۆیان دوور دەکردەوە. کاتێك موهەلهیل و براکەیمان گرفتار کرد و کوڕی عەمرۆ و کوڕی شەهابمان بەند کرد. لەناو تەغلەبیەکان هەر ئەندام سپییەکی خەوتو لەنیمەرۆ و هەلگری ئاوی دەمی فێنك کەرەوەی جەرگەکانمان دیل کرد. ئەوساتەی موهەلهیلییەکان دەیانقیژاند: ئای بەکرییەکان! ئایا شێوەی پارێزگاری کردن لەخۆتان و کەس وکارتان بەم شێوەیە؟ هاوار لەئێوە ! هاوار لەئێوە! بارەگاکەتان لەیەك هەلۆەشا، ها ئەی تەغلەبییەکان، من کوری رەزابم. ئەوان لەهەر رێرەوێك هەلاتن بەهەمان شێوە کەوشترملەکان لەسەر تەپۆلکەکان بلاو دەبنەوە. لەسەردەستی کەلە پیاوانی وەك عامر و جەناب، ئاشی مەرگ لەناو ئەوان سورا. ئەوان بوون بەدوو دەستە: دەستەیەکیان رایکرد و ئاوڕیان بۆ دواوە نەدایەوە و دەستەیەکیان کوژران و لەخاك و خوێندا گەوزان. کاتێك سەر بەرز بکەینەوە، پایەبەرزی ئێمە زیاد دەکات و پێش دەکەوێت بەهەمان شێوە کەئاسمان لەسەر هەورەکان راوەستاوە و لەپێشە.

هۆکاری شەڕ کردنی ئەو لەگەڵ منالەکانی قین کوڕی جسر ئەوە بوو یەکێك لەخوشکەکانی زوهەیرلەناو ئەوان مێردی کردبوو. رۆژێك نێردراوی ئەو ژنە هات و هەنبانەیەکی پڕ لەزیخ و هەنبانەیەکی پڕلەچقلی (گەوەن)ی هێنا. زوهەیر وتی: ئەم ژنە ئاگادارتان دەکاتەوە کەدوژمنێکی بەهێز و تێکۆشەر هێرش دەکاتە سەر ئێوە. لەمالەکانی خۆتان برۆنەدەر و کۆچ بکەن. جولاح کوڕی عەوف سۆحەمی وتی: بەوتەی ژنێك لەمالەکانی خۆمان نارۆینەدەر. زوهەیر کۆچی کرد و جولاح مایەوە.

بەرەبەیان دوژمن هێرشی کردە سەریان و هەموو کەسانی جولاحیان کوشتار کرد و سامانەکانی ئەوانیان تالآن کرد. زوهەیر رۆشت و لەگەڵ منالّەکانی خۆی لەجەناب کۆبوویەوە. ئەم هەواڵە بەسوپا گەشت و مەبەستی ئەویان کرد. لەبەرابەر ئەوان خۆراگری کرد و ئەوانی تێکشکاند و سەرکردەی ئەوانی کوشت و ئەوان بێ هیوا پاشەکشێیان کرد. کاتێك ژیان زوهەیر درێژەی کێشا و ساڵەکانی تەمەنی درێژ بوویەوە، کوڕی براکەی خۆی عەبدوللە کوڕی عەلیمی کردە جێگری خۆی. زوهەیر رۆژێك وتی: بزانن هۆز دەبێت رۆژێك کۆچ بکات. عەبدوللە وتی: بزانن کەهۆز دەمێنێتەوە. زوهەیر وتی: ئەوە کێیە مەبەستی ناسازگاری دەژەنێت؟ وتیان: کوڕی براکەت عەبدوللە کوڕی عەلیم. وتی: دوژمنترین دوژمنانی پیاو کوڕی براکەیەتی. ئەوسا دەستی بەخواردنەوە کرد و ئەوەندەی خواردەوە تا مرد.

لەناو ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو خواردیانەوە تا مردن، عەمرۆ کوڕی کلسومی تەغلەبی و باوکی عامیر رمباز دەینران.

## شەڕی بەرەدان

داستانی ئەم شەڕە بەم شێوە بوو: زیاد کوڕی هوبوولە پاشای شام کە لەهۆزی سەلیح کوڕی حیلوان کوڕی عیمران کوڕی حاف کوڕی قوزاعە بوو، هێرشی کردە سەر حۆجر کوڕی عەمرۆ کوڕی مەعاویە کوڕی حارسی کێندی پاشای عەرەبەکانی نەجد و پانتاییەکانی عێراق ناسراو بەناوی (اکل المرار). پێشتر حۆجر هێرشی کردبووە سەر هۆزەکانی کیندە و رەبیعە لەبەحرەین. ئەم هەواڵە بەگوێی زیاد کوڕی خوبولە گەشت. ئەو سوپاکەی خۆی بۆ لای بنەماڵە و کەسانی حۆجر و رەبیعە نارد و مەبەستی تالآن کردنی سامانی ئەوانی کرد و ئەوان (خلوف )بوون یانی پیرەپیاو و ژنان و منالْ کەپیاوەکانیان رۆشتبوونە شەڕ و ئەوان بێ کەس و پەنا لەماڵەکاندا دەژیان. زیاد هێرشی کردە سەر بارەگای ژنان و ئەوانی گرفتار کرد و سامانەکانی تالآن و دیلەکانی گرت کەهند کچی زالْم کوڕی وەهب کوڕی حارس کوڕی مەعاویە لەناویاندا بوو.

پیاوانی هۆزی حۆجر و کیندە و رەبیعە لەتالآن و دەستدرێژی زیاد ئاگادار بوونەوە و لەشەڕ گەرانەوە و شوێنی کەوتن. گەورەکانی رەبیعە وەك عەوف کوڕی موحەلیم کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان و عەمرۆ کوڕی ئەبی رەبیعە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان و هاوشێوەکانی ئەم دووانە، لەگەڵ حۆجر بوون. ئەوان عەمرۆیان لەبەرەدان لەنزیك عەین ئۆباغ بینی و بینیان لەشوێنێکی ئەمندا قەلآی گرتووە و کەس ناتوانێت بیدۆزێتەوە. حۆجر لەداوێنی کێو دابەزی و هۆزەکانی بەکر و تەغلەب لەگەڵ حۆجر لەداوێنی کێو لەسەحسەحان لەسەر ئاوێك کەبەحەفیر ناویان دەبرد، ئۆردوویان هەڵدا. عەوف کوڕی مۆحەلیم و عەمرۆ کوڕی ئەبی کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان پەلەیان کرد و بەحۆجریان وت: ئێمە دوای زیاد کەوتوین ئەگەری هەیە بتوانین هەندێ لەوەی بەتالآنی بردووە وەربگرینەوە. ئەم دووانە شوێنی کەوتن. لەنێوان ئەو و عەوف پەیمانی برایەتی بەسترابوو. عەوف هاتە لای و پێی وت: ئەی باشترینی لاوەکان، ژنەکەم ئۆمامە بۆ من وەگەڕێنە. ئەو ژنی گەراندەوە و

ژن دوگیان بوو. ژن کچێکی هێنایە دنیا و عەوف ویستی زیندە بەچاڵی بکات بەڵام عەمرۆ کوڕی ئەبی رەبیعە رێگری کرد و وتی: ئەگەری هەیە خەڵکانێك لەو دروست ببن. لەبەر ئەمە ئەویان بە دایکی خەڵك (ام الناس)ناوبرد. حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی حۆجر اکل المراری بەهاوسەری هەڵیبژارد کەعەمرۆی بۆ هێنایە دنیا و لەبەر ئەمە بەویان وت کوڕی ام الناس.

دواتر عەمرۆ کوڕی ئەبی رەبیعە بەزیادی وت: ئەی باشترینی جوامێران، ئەو وشترەکانی منی داگیر کردووە، بۆم بگەرێنەرەوە. وشترەکانی گەڕاندەوە و لەناو ئەوان وشترێکی نێربوو کە خۆی لەچنگی ئەو دەرباز کرد و روی کردە وشترە مێ کان. عەمرۆ ئاوقای وشترەکەبوو و بەچالاکی لەزەویدا. زیاد پێی وت: ئەی عەمرۆ، ئەگەر ئێوە منالەکانی شەیبان، پیاوانتان وەك وشتر لەزەوی دەدا، بۆ خۆتان کەسێك بوون و بەم شێوە سوك و ریسوا نەدەبوون. عەمرۆ پێی وت: کارێکی کەمت کرد وناوێکی گەورەت برد و زیانێکی مەترسیدارت لەسەر خۆت دروستکرد. سوێند بەخوا تاوانەکەی دەدیتەوە و رۆژێك دگات ددانەکانی من لەخوێنی خۆت تێراو بکەیت. ئەوسا لەسەر سەمەندی تێژپێی خۆی سوار بوو رویکردە حۆجر و کەس ئاگاداری نەبوویەوە. حۆجر، سەدوس کوڕی شەیبان کوڕی زوهەل و سۆلیع کوڕی عەبد غەنمی نارد تا هەواڵەکانی تایبەت بەوان کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی لەچۆنییەتی سوپا ئاگادار ببنەوە. ئەم دووانە بەرێکەوتن و شەوانە هاتنە سەر سوپاکەی زیاد و بینیان تالانییەکان دابەش کراون. لەمکاتەدا مۆمیان هێنا و خواردنی رۆن و خورمایان بەخەڵکاندا. کاتێك خەڵك لەخواردن تێربوون، زیاد وتی: هەر کەس کۆڵێك دار بێنێت، باوەشێك خورمای پێدەدەم. سەدوس و سەلیع دوو کۆڵیان هێنا و دوو باوەش خورمایان وەگرت و لەنزیك خێوەتەکەی ئەو جێگەیانگرت. لەم کاتەدا سەلیع بۆ لای حۆجر گەرایەوەو ئەوی لەچۆنیەتی سوپاکەی زیاد ئاگادار کردەوە و خورماکەی نیشان دا.

سەدوس وتی: من لەشوێنی خۆم ناجولێم تا هەواڵێکی راست کۆدەکەمەوە. لای ئەو خەڵکە مایەوە و گوێی هەڵخست و قسەکانیانی بیست. هند، ژنی حۆجر، لەپشت سەری زیاد بوو. ژن بەزیادی وت: ئەم خورمایان لەهیجر بۆ حۆجر بەدیاری هێناوە

و ئەم خورمایان لەدومە الجەندەل. دواتر هاوەڵانی زیاد لێی دورکەوتنەوە. سەدوس دەستی لەسەر شانی یەکێك لەهاونشینەکانی خۆی دا (ئەم کارەی لەترسی ناسینەوە کرد) و پرسی: تۆ کێیت؟ وتی: فلان کوڕی فلان. سەدوس لەخێوەتەکەی زیاد نزیك بوویەوە بەشێوەیەك وتووێژی ئەوانی دەبیست. زیاد لەژنی حوجر نزیك بوویەوە و بۆنی کرد و ماچی کرد و لەئامێزی گرت و خۆشەویستی لەگەڵ کرد. زیاد بەژنەکەی وت: ئێستا چ گومانێکت لەبارەی حوجرەوە هەیە؟ ژن وتی: گومانم نییە بەڵکو دڵنیام. سوێند بەخوایەتی خوا کەحوجر لەشوێنکەوتنی تۆ دەست هەڵناگرێت تەنانەت ئەگەر پەنا ببەیتە کۆشکە سورەکان (یانی کۆشکەکانی شام). ئێستا ئەو دەبینم لەگەڵ شاسوارەکاندا بەدوای تۆ بەڕێکەوتووە. ئەو ئەوان هان دەدات و ئەوان ئەو هان دەدەن و تینوی خوێنی تۆیە و لێوەکانی هاوشێوەی وشترێك کەچقڵی خواردبێت، کەفیان کردووە. رابکە، رابکە! لە پشت سەرت کەسێکی پێداگر، خەڵکانێکی زۆر، فریۆیك و باوەرێکی بەهێز هەیە. زیاد دەستی بەرز کردەوە و شەقەزلەیەکی لەروخساری ئەو مانگ روخسارەدا و دواتر پێی وت: بۆیە ئەم قسانە دەکەیت چوونکە دڵت لای ئەوە و خۆشت دەوێت. ژن وتی: سوێند بەخوا کەس بەئەندازەی ئەو دوژمنم نییە و کەسم بە دوور ئەندێشتر و چالاکتر لەو لەبێداری و خەودا نەبینیوە. ئەگەر چاوەکانی بخەوێت، ئەندامێکیتری بەئاگایە! کاتێك دەیویست بخەوێت، فەرمانی بەمن دەدا کاسەیەك پڕ شیر لەسەر سەری دانێم. شەوێك کەخەوتبوو و من لەنزیکیەوە بووم بووم، رەشمارێك هات و لەسەری نزیك بوویەوە. ئەو سەری خۆی لابرد. روی کردە دەستی و ئەو دەستی خۆی داشارد. روی کردە قاچی و ئەو قاچی خۆی بەرزکردەوە. رەشمار روی کردە کاسە شیرەکە و کەمێکی لێخوارد و دواتر هەڵیهێنایەوە و کردیەوە ناو کاسە شیرەکە. وتم: ئێستا هەڵدەستێت وشیر دەخوات و دەمرێت و من لێی ئاسودەدەبم. لەخەو هەستا و وتی: کاسەی شیرەکە لەمن نزیك بکەرەوە. شیرەکەم دایە دەستی بۆنی کرد و فڕیدا و رشتی. دواتر وتی: رەشمار چی لێهات؟ وتم: لێرەدا مارێکم نەبینیوە. وتی: سوێند بەخوا درۆ دەدەکەیت. سەدوس وتووێژی نێوان ژن و زیادی بیست. ئەو گەرایەوە و هاتەلای حوجر و کاتێك گەشت وتی:

اتاك المرجفون با مرغيب — على دهش و جئتك باليقين

فمن يك قد اتاك بامر لبس — فقد اتى بار مستبين

واتاکەی: ئاگادارکەرەوان، بەترسەوە، بۆ تۆ هەواڵێکیان لەکارە نهێنیەکان هێناوە و من بەتەواوی دڵنیام. ئەگەر کەسێکیتر هەواڵێکی ناراست و نامۆی بۆ تۆ هێنابێت، من هەواڵێکی رون و ئاشکرام بۆ هێناویت.

دواتر ئەوەی بیستبووی، بۆ حۆجری گێرایەوە. حۆجر لەگەڵ گوێ گرتن لەوتەکان گەمەی بەچقل و چەوێڵ دەکرد و لەتاو رق و داخ لەو چقڵەی دەخوارد و لەبەر تاڵی نەیدەزانی چی دەخوات. کاتێك سەدوس وتارەکەی خۆی تەواو کرد، بینی حۆجر چقڵەکەی خواردووە. لەم رۆژەوە بەویان وت ئاکل المرا(چقڵخۆر). مەرار چقڵ یا گیایەکی زۆر تاڵە کەهیچ ئاژەڵێك نایخوات و ئەگەر بیخوات دەمرێت. دواتر حۆجر فەرمانیدا لەناو خەڵك جار بدەن. ئەو لەگەڵ هاوەڵانی خۆی سوار بوو بەرەو زیاد غاریدا. شەڕێکی هەرچی قورستر رویدا و زیاد و شامیەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا. بەکر و کیندە هەموو سامان و ئەسیرەکانیان وەرگرتەوە. سەدوس روانی و زیاد کوڕی هوبوولەی ناسییەوە و هێرشی کردەسەر و لەئەرزیدا و دەست وپێی بەست. کاتێك عەمرۆ کوڕی ئەبی رەبیعە ئەوی بینی، رژدی برد و بەرِم هێرشی کردە سەری و کوشتی. سەدوس تورە بوو و وتی: دیلی منت کوشت کەخوێنبایی ئەو خوێنبایی پاشاکانە. ئەو دووانە داوەریان بردە لای حۆجر. حۆجر لەسەر عەمرۆ و خەڵکەکەی دانی خوێنبایی پاشای دیاری کرد و لەسامانی خۆی هاوکاری کردن. حۆجر ژنەکەی خۆی گرت و بەدوو ئەسپی تیژپێ بەستیەوە. ئەوسا ئەسپەکانی غاردا و ژنەکەی لەت لەت کرد. دەستەیەك دەڵێن بەم شێوە نییە بەڵکو ئەوی سوتاند. ئەو لەم بارەوە وتویەتی:

ان من غره النساء بشی ء — بعد هند لجتهل مغرور

حلوة العين و الحديث و مر — كل شىء اجن منها الضمير

كل انثى و ان بدت منها — اية الحب حبها خيتعور

واتاکەی: هەر کەس دوای هند شەیدای ژنان بێت، شەیدایەکی نەزانە. چاوەکانی شیرینە و تەکانی شیرینتر. بەلام هەمووی ئەوەی لەدڵیدا شاراوەیە، تاڵ و ژەهراوییە. هەر مێینەیەك هەرچەندە نیشانەی هاورێیەتی نیشانی تۆ بدات، هاورێیەتییەکەی رەنگاورەنگ و ناسەقامگیرە.

## دواتر حۆجر بۆ حیرە گەرایەوە.

من دەڵێم: دەستەیەك لەزاناکان بەم شێوەیان وتووە کەزیاد کوڕی هوبولەی سەلیحی پاشای شام شەڕی حۆجری کرد. ئەمە راست نییە چوونکە پاشاکانی سەلیح لەدەوروبەری شام لەوشکانی لەخاکی فەلەستین تا قنسەرین و سەرزەمینەکانی رۆم نیشتەجێ بوون. لەدوای ئەوان غەسانییەکان ئەم سەرزەمینەیان گرت. هەموویان کاربەدەستانی رۆمی بوون بەهەمان شێوە کەپاشاکانی حیرە نوێنەرانی پاشاکانی ئێران لەفەرمانرەوایەتی کردنی وشکانی و عەرەبەکانیتر بوون. سەلیح و غەسان هیچ کام بەشێوەیەکی سەربەخۆ فەرمانرەوایی شام نەبوون و بەشێوەیەکی خودموختار و بێ پەیوەست بوون بەلایەنێکیتر، تەنانەت یەك بست لەخاکی شامیان لەژێر دەستدا نەبوو.

ئەوەی دەڵێن: پاشای شام، راست نییە. زیاد کوڕی هوبولەی سەلیحی پاشای بەرزاییەکانی شام، رۆژگارێکی درێژ پێش لەحۆجر ئاکل المرار بوو چوونکە حۆجر باوەگەورێی حارس کوڕی عەمرۆیە کە لەرۆژگاری قوباد باوکی ئەنەوشیروان فەرمانرەوایەتی حیرە و عەرەبەکانی عێراقی دەکرد. لەنێوان پاشایەتی قوباد وکۆچ کردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە، نزیکەی سەد و سی ساڵە. غەسانییەکان لەدوای سەلیحییەکان بۆ شەشسەد ساڵ (و بەوتەی هەندێ کەس بۆ پێنسەد ساڵ) فەرمانڕەوایەتیان کرد. ئەمان لەدوای سەلیحەوە بوون و زیاد دوایین پاشای سەلیح نییە. لێرەوە درێژی رۆژگاریش درێژییەکی تر بەخۆوە دەگرێت. ئەمە جیابوونەوە و کەلێنێکی گەورەیە. کەواتە چۆن راستە کەزیاد کوڕی هوبولەی لەرۆژگاری حۆجر پاشا بێ بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەری؟ لەبەر ئەوەی مێژونوسانی عەرەب لەسەر ئەم شەڕانە کۆکن، ئەبێت رێگە چارە و سازگارکردنێکی رون و ئاشکرای بۆ

بدۆزینەوە. ڕاستترین وتە ئەوەیە: زیاد کوڕی هوبولە هاوڕۆژگاری حوجر سەرپەرەستی دەستەیەك لەخەڵك یا فەرمانڕەوا بەسەر بەشێك لەدەوروبەری شام بووە. بەم شێوەیە ئەم وتەیە راست دەبێت. و خوا زاناترە.

ئەمیش کەدەڵێن حوجر بۆ حیرە گەڕایەوە، راست نییە چوونکە پاشاکانی حیرە منالەکانی عودەی کوڕی نەسری لەخمی بوون و پاشایەتی ئەوان تا رۆژگاری قوباد پچڕانی تیا نییە وتەنیا لەم سەردەمەدا بوو پچڕانی تێکەوت. ئەو بوو کەحارس کوڕی عەمرۆ کوڕی حوجری ئاکل المراری بۆ فەرمانرەوایەتی دیاری کرد. پێشتر ئاماژەمان بەمەدا. کاتێك ئەنەوشیروان هاتە سەر کار، حارسی لابرد و لەخمییەکانی بۆ پاشایەتی گەڕاندەوە. لەوانەیە دەستەیەك لەکێندیەکان، کوێرکوێرانە ئاماژەیان بەم بابەتە دابێت. و خوا زاناترە.

باوکی عوبەیدە ئاماژەی بەم شەڕەداوە بەلأم نەیوتووە کەکوڕی هوبولە خەڵکی سەلیح بووە. ئەو وتوویەتی ئەم پیاوە، غالیب کوڕی هوبولە یەکێك لە اشاکانی غسانە بووە. ئەو ئاماژەی بۆ گەڕانەوەی حوجر بۆ حیرە نەداوە. بەم شێوەیە تۆزی گومان لەم داستانە دەسردرێتەوە.

## کوژرانی حۆجر باوکی ئەمرۆ ئەلقەیس و شەڕەکان بەهۆی کوژرانی ئەو تا مردنی ئەمرۆ ئەلقەیس

ئێمە سەرەتا ئاماژە بەهۆکاری پاشایەتی ئەو بەسەر عەرەبەکانی نەجد دەدەین و دواتر رووداوەکان تا کوژرانی ئەو و دواهاتەکان درێژە پێدەدەین.

پێشترنەزانەکانی بەکر بەسەر بیرمەندەکانی ئەواندا زاڵ بوون و کاروبارەکانیان گرتە دەست. لێرەوە بوو کەبەهێز ناتەوانی لەناوبرد. بیرمەندان بە ردی هەموو لایەنەکانیان لێکدایەوە و بڕیاریان دا پاشایەك بۆ خۆیان هەڵبژێرن تا دادی ناتەوان لەبەهێز و زۆردار وەربگرێت. عەرەبەکان ئەوانیان لەم کارە دورخستەوە و زانیان ئەم کارەیان بۆ ناچێتە سەر کەپاشا لەخۆیان بێت چوونکە ژمارەیەك دەبنە فەرمانبرداری و ژمارەیەك نافەرمان (عەرەبەکان لەخۆ بێزار و بێگانە پەرستن). ئەوان بەرەو لای تۆبعان رویان کردە یەمەن کەبۆ عەرەبەکان هاوشێوەی خەلیفە بۆ موسوڵمانان بوو. داویان لێکرد پاشایەکیان بۆ هەڵبژێرێت. تۆبەع، حۆجر کوڕی ئاکل المراری بۆ پاشایەتی هەڵبژارد. ئەو رۆشتە لای ئەوان ولەسەرزەمینی (بەتن عاقڵ) دابەزی و هێرشی کردە سەر بەکرییەکان و هەمووی ئەوەی لەدەستی لەخمییەکان بوو (لەسەرزەمینی بەکرییەکان) لەوانی سەندەوە و مایەوە و لەوێ مرد و هەر لەوێ بەخاك سپێردرا.

کاتێك ئەو مرد، عەمرۆ کوڕی حجر ئاکل المرار کەئەویان بەمەقسور (دەست کورت، کوڵ) بانگ دەکرد، دوای باوك هاتە سەر تەخت. لەبەر ئەوە پێیان دەوت مەقسور چوونکە نەیتوانی جێگەی باوکی لەپاشایەتیدا بگرێت. براکەی معاویە کەئەویان بە (جون) رەش ناودەبرد، فەرمانداری یەمامەبوو. کاتێك عەمرۆ مرد، دوای ئەو کوڕەکەی حارس جێگای گرتەوە. ئەو لەکاری پاشایەتیدا سەختگیر و بەهێز و بەناوبانگ بوو. کاتێك قوباد کوڕی فیرۆز پاشایەتی ئێرانی گرتەدەست، هاورۆژگاری ئەو مەزدەك دەرکەوت و خەڵکی بۆ بێ باوەڕی و بێ دینی بانگێشت کرد کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

قوباد بانگێشتەکەی وەلأم دایەوە و لەم کاتەدا پاشایەتی لەدەستی مونزەر کوڕی ما السما نوێنەری فەرمانڕەوای خوسرەوان لەسەر حیرە و دەوروبەرەکەی بوو. قوباد داوای لێکرد باوەڕ بەئایینی مەزدەکی بێنێت. بەلأم ئەو رازی نەبوو. پاشای ئێران حارس کوڕی عەمرۆی بۆسەر ئایینی مەزدەکی بانگێشت کرد و ئەو رازی بوو و قوباد ئەوی کردە پاشای حیرە و مونزەری لە پاشایەتی ولأتەکەی لابرد.

سەبارەت بەپاشایەتی ئەو ئاماژەیان بەبابەتی دیکەیش داوە کە لەرووداوەکانی رۆژگار قوباد ئاماژەمان پێدا.

ئەوان بەم شێوە مانەوە تا خوسرەو ئەنەوشیروان دوای باوکی قوباد بەپاشایەتی گەشت و مەزدەك و هاورێکانی کوشتار کرد و مونزەر کوڕی ما السمای وەك پارێزگاری حیرەدیاریکرد و بەدوای حارس کوڕی عەمرۆدا گەڕا کە لەماڵەکەی خۆی لەهەمبارێکدا دەژیا. ئەو هاورێ لەگەڵ منالّ و سامانەکەی و نۆکەرەکانی هەلأت و مونزەر لەگەڵ سوارەکانی تەغلەب و ئەیاد و بەهرا شوێنی کەوتن. حارس کوڕی عەمرۆ بۆ سەرزەمینی کەلب رایکرد و رزگاری بوو و ئەوان سامان و نۆکەرەکانی ئەویان  تالأن کرد و دیلیان کرد. تەغلەبیەکان چل و هەشت کەسیان لەبنەماڵەی ئاکل المرار ( و لەناو ئەواندا عەمرۆ و مالیك کوڕانی حارس) ئەسیر کرد و بۆ لای مونزەریان برد کە ئەوانی لەسەرزەمینی منالّەکانی مەرینا کوشت. عەمرۆ کوڕی کولسوم لەمباروە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **فآبوو بـالنهاب و بـالسيـايا** | **و ابنـا بـا لملوك مصفدينـا** |

واتاکەی: ئەوان لەگەڵ دیلەکان و سامانە تالأن کراوەکان هاتن و ئێمە شازادەکانمان بەدیلی گەڕاندەوە.

ئەمرۆ ئەلقەیس سەبارەت بەوان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ملوك من بني حجر بن عمرو | يساقون العيشة يقتلونا |
| فلو في يوم معركة اصيبووا | و لكن في ديار بني مرينا |
| دولم تغسل جما جمهم بغسل | و لكن في الدما مر مليـنا |
| ثظل الطير عكافة عليهم | و تنتزع الحواجب و  العيونا |

واتاکەی: چەندین پاشایان لەمناڵەکانی حوجر کوڕی عەمرۆ هێنا تا شەوانە خوێنیان برێژنە سەر زەوی. خۆزگە لەگۆرەپانی شەڕدا دەکوژران بەلام بە داخەوە لەسەرزەمینی مناڵەکانی مەرینا گیانیان دا. سەری ئەوان نە لەناو ئاو و گولاو بەڵکو لەناو خوێندا گەوزا. باڵندەکان بەردەوام بەسەر لاشەکانیان هەڵدەفڕین و چاو و برۆی ئەوانیان هەڵدەکەند.

حارس لەسەرزەمینی کەلب مایەوە. کەلبیەکان گومانیان وایە ئەوان ئەمیان کوشت و بیرمەندانی کیندە گومان دەکەن کەئەو رۆژێك بۆ ڕاو رۆشتەدەر و دوای بزنێکی نێر لە اسکەکانی کێوی و دەشتی کەوت و لەشوێن کەوتنی ئەو هیلاك و ناتەوان بوو. لەبەر ئەمە سوێندی خوارد جگە لەجەرگی ئەو هیچیتر نەخوات. سوارەکان ئەویان دۆزییەوە و دوای سێ رۆژ هێنایانەوە کەنزیك بوو لەبرساندا بمرێت. جەرگی بزنیان بۆ برژاند کەبەشێکی بەگەرماوگەرمی و خوارد و لەهەمان ساتدا گیانی دا.

کاتێك حارس لەحیرە بوو، گەورەکانی چەندین هۆز لەنزار رۆشتنە لای و وتیان: ئێمە فەرمان لەتۆ دەبەین. لەنێوان ئێمە لەدوژمنایەتی و کوشت و بڕ و خوێن ڕشتن ئەوە کەوتۆتەوە کەئاگاداری، ئەترسین هەموومان لەناوبچین. کوڕەکانت لەگەڵ ئێمە بنێرە تا بێنە لای ئێمە و دەستی ئێمە لەکوشتنی یەکتر کورت بکەنەوە. ئەو کوڕەکانی کردە فەرمانرەوای هۆزە عەرەبەکان. کوڕەکەی حوجری کردە فەرمانرەوای غەتەفان، مناڵەکانی ئەسەد کوڕی خوزەیمە، شۆرەحبیلیان (کە لەرۆژی شەڕی کولابدا کوژرا) کردە فەرمانڕەوایی بەکر کوڕی وایل و ئەوانیتر، مەعدی کەرِب (ناسراو بەبۆنخۆش لەبەر ئەوەی سەری خۆی بەمادە بۆنخۆشەکان چەور ئەکرد) کردە فەرمانرەوای قەیسی عەیلان و هۆزەکانیتر و سەلەی کردە فەرمانرەوای تەغلەب و نەمری کوڕی قاست و مناڵەکانی سەعد کوڕی زەید کوڕی مەنات لەمناڵەکانی تەمیم.

حوجر لەناو مناڵەکانی ئەسەد مایەوە. لەسەر ئەوان دیاری وباجی دانابوو کەساڵانە بۆ کۆکردنەوەی نیازەکانی خۆی لەوانی دەستاند. رۆژگار بەمشێوە تێپەڕی.

دواتر ئەو کەسانێکی بۆ وەرگرتنی باج ڕەوانە کرد. ئەوان لەسەرزەمینی تەهامە بوون. ئەوان لەنێردراوەکانیان دا و دەریان کردن. ئەم هەواڵە بەحوجر گەیشت و ئەو لەگەڵ سوپایەك لەرەبیعە و سوپایەك لەئەرتەشی براکەی لەقەیس و کەنانە هێرشی کردە سەر ئەوان و گەورەکانیانی گرت و یەك یەکیانی بەداردەست کوشت. سامانەکانی تالآن کرد. ئەوانی بردە تەهامە و ژمارەیەکی زۆر لەگەورەکانی خستە زیندانەوە کە لەناو ئەواندا وتەبێژی ناوداری عەرب عوبەید کوڕی ئەبرەس دەبینرا.

ئەو هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و ناردی بۆ لای حوجر و تیایدا داوای لێخۆشبوونی لێکرد. دڵی حوجر نەرم بوو و کەسی نارد و ئەوانی گەڕاندەوە. کاتێك گەشتنە دووری یەك ڕۆژە لەو، کاهینی ئەوان عەوف کوڕی ڕەبیعە کوڕی عامری ئەسەدی پێشگویی کرد: کێیە ئەم پاشا ناودارە، بەختەوەر و بەهێزە، لەناو وشترانێك هاوشێوەی گایەلی ئاسکەکان، ئەمە خوێنی ئەوە هەڵوقلاو، بەیانی ئەو یەکەم کەس ئەبێت لەتالآنی کوژراوەکان. وتیان: ئەو کێیە؟ وتی: ئەو ئەحجەرە پاشای سەرگەردان. ئەوان هەموو سوار چوارپێ دەستەمۆکان و تیژ پێ و بلەز و ناسازگارەکانی خۆیان بوون و هێرشیان کرد تا گەشتنە لەشکرگەی حوجر و لەناو جێگاگەی هێرشیان کردە سەری و خوێنیان ڕشت. عیلەبا کوڕی حارس بەشمشێر لێیدا و کوشتی. حوجر باوکی ئەوی کوشتبوو. کاتێك کوژرا منالەکانی ئەسەد وتیان: ئەی دەستەکان قەیس و کەنانە، ئێوە برایان و کوڕە مامەکانی ئێمەن وئەم پیاوە لە وێن و خانەدانی ئێمە دوورە و لەئێوەیش. ئێوە کرداری ئەوتان بینی و بینیتان خۆی و خەڵکەکەی چۆن مامڵەتان لەگەڵ دەکەن. ئەوان هاورێ و کەسەکانی حوجریان تالآن کرد. لاشەی ئەویان لەپارچەیەکی سپییەوە ئاڵآند و خستیانە سەر ڕێگە. کاتێك قەیس و کەنانە ئەویان بینی، جل وبەرگ و کەل و پەلەکانی ئەویان تالآن کرد. عەمرۆ کوڕی مەسعود پەنای بەبنەماڵەکەی دا.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك حوجر خۆ ڕێکخستنی منالەکانی ئەسەدی بینی، ترسا و لەعویمێر کوڕی شێجنە یەکێك لەپیاوەکانی منالەکانی عوتارد کوڕی زەید کوڕی مەنات کوڕی تەمیم بۆ کچەکەی هند و ژنان و کەسەکانی داوای پەنای کرد. ئەوسا بەمنالەکانی ئەسەدی وت: ئەگەر ئێوە بەمشێوەتان دەوێت من لەناو ئێوە دەڕۆم و

بەجێتان دەهێڵم. ئەوان لەسەر ئەمە لەگەڵیا ڕێك كەوتن. ئەو ڕۆشت و ڕۆژگارێك لەناو خەڵكەكەی خۆیدا مایەوە. دواتر لەشكرێكی گەورەی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان كۆكردەوە و هێرشی كردە سەر ئەوان و لەخۆبایی بوو و شانازی بەسوپاكەی خۆیەوە كرد. منداڵەكانی ئەسەد ڕێك كەوتن و وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر بەسەر ئێوەدا زاڵ بێت وەك منداڵ هەڵس و كەوتتان لەگەڵ ئەكات. بەڵام لەم ژیانە چ سوود؟ هاوشێوەی پیاوان و گەورەكان بمرن و لەم سوكایەتییە خۆبەدوور بگرن. ئەوان كۆبوونەوە و ڕووبەڕووی حوجر بوونەوە و چاویان پێیكەوت و شەڕێكی قورسیان هەڵگیرساند. سەركردەی ئەوان عەلبا كوڕی حارس بوو. هێرشی كردە سەر حوجر و بەشمشێر لێیدا و گیانی گرت. كێندییەكان و هاوڕێكانیان شكستیان خوارد و هەڵاتن. منداڵەكانی ئەسەد زۆر لەهاوڕێیان و كەسەكانی حوجریان گرفتار و خەڵكەكەی ئەویان تاڵان كرد بەشێوەیەك بەدەستی پڕ لەسامان گەڕانەوە. دەستیان بەسەر كەنیز و ژن و سامانەكانی ئەویشدا گرت و لەناو خۆیاندا دابەشیان كرد.

دەستەیەك دەڵێن حوجر بەزیندوویی دەستگیر و زیندانی كرا. لەم كاتەدا كوڕی خوشكی عەلبا هەستا و بەكێردێك لێیدا چوونكە حوجر باوكی ئەوی كوشتبوو. كێرد ئەوی بریندار كرد بەڵام نەیكوشت. حوجر وەسیەت نامەی خۆی نوسی و دایە دەستی پیاوێك و پێی وت: سەرەتا بڕۆ لای كوڕەكەم نافیع (ئەو كوڕە گەورەیە)، ئەگەر گریا و شینی كرد لێی خۆش ببە و پرسیاری یەك یەكی بنەماڵەكەی لێ بكە و داوا بكە میوانداریت بكات تا دەڕۆیتە لای كوڕە بچوكەكەم ئەمرۆ ئەلقەیس. هەر كەس نەگریا، ئەسپ و كەرەستەكانی شەڕ و وەسیەت نامەكەم بەو بسپێرە. ئەو لە وەسیەت نامەكەی خۆیدا نوسیبووی كە كێ كوشتوویەتی و چارەنوسی بە كوێ گەشتووە.

پیاو وەسیەتنامەكەی بردە لای نافیع، ئەو گریا. دواتر ڕۆشتە لای یەك یەكی ئەوان و بەهەمان شێوە شینیان كرد. دواتر ڕۆشتە لای ئەمرۆ ئەلقەیس و ئەوی بینی لەگەڵ هاونشینەكەی خۆی شەراب دەخوات و تاوڵە دەكات. پێی وت حوجر كوژرا. ئەمرۆ ئەلقەیس سەیری نەكرد. هاونشینەكەی دەستی لەیاری هەڵگرت. ئەمرۆ ئەلقەیس وتی: یاری بكە. ئەو درێژەی بەیارییەكە دا و دواتر وتی: نەمویست

دانیشتنەکە لەتۆ تێك بدەم.

دواتر بەسەرهاتی باوکی لەنێردراوەکە پرسی و ئەویش هەموو شتێکی گێڕایەوە. ئەمرۆ ئەلقەیس وتی: ژن و بادە لەمن حەرام بوو تا ئەو کاتەی لەمناڵەکانی ئەسەد سەدکەس نەکوژم وسەد کەسیش رزگار نەکەم.

حۆجر بەبیانوی ئەوەی ئەمرۆ ئەلقەیس شێعری دەهۆنییەوە، ئەوەی لەخۆی دور کردەوە. شەرمی لەم کوڕە بوو و خوی بەلەپێشتر لەو دەزانی. دایکی ئەمرۆئەلقەیس فاتیمە کچی رەبیعە کوڕی حارس خوشکی کولەیب کوڕی وایل بوو. ئەو لەناو هۆزە عەرەبەکاندا دەگەڕا و لە تالاوەکاندا دەیخواردەوە و دەڕۆشتە راو و ئاسکی چاو ڕەش و کچی سیمین لەشی نێچیر دەکرد. کاتێك هەواڵی کوژرانی باوکی پێگەشت، لە((دەمون)) لەخاکی یەمەندا بوو. کاتێك بیستی، ئەمەی شێعرەی وت:

**تطاول الليل علينا دمون دمون انا معشر يمانون**

**و اننا لقومنا محبوون**

واتاکەی: لەدەمون شەو هێرشی کردە سەرمان و شەو درێژەی کێشا. ئەی دەمون، ئێمە یەمەنییەکانین. خەڵکانی خۆمان خۆش دەوێت

دواتر وتی: لەعەقڵدا منی بە سوك زانی و بۆ تۆڵە سەندنەوە منی هەڵبژارد. ئەمرۆ وشیاری نەبێت و سبەی مەستی. ئەمرۆ بادەیە و بەیانی کارێکی گەورەی ئەسادە. ئەم وتانە بوونە پەند. دواتر کۆچی کرد تا گەشتە لای بەکر و تەغلەب و داوای یارمەتی لەوان کرد. ئەوان وەڵامیان دایەوە و ئەو سیخوڕەکانی بەرەو مناڵەکانی ئەسەد نارد کەئاگادار بوونەوە و پەنایان بۆ مناڵەکانی کەنانە برد. سیخوڕەکانی ئەمرۆ ئەلقەیس لەگەڵ ئەواندا بوون. عەلبا کوڕی حارس پێی وتن: ئاگادر بن چوونکە سیخوڕەکانی ئەمرۆ ئەلقەیس بەهەواڵەکانی ئێوە بۆ لای ئەو گەڕانەوە و ئێوە لەناو مناڵەکانی کەنانەن. شەوانە کۆچ بکەن و مناڵەکانی کەنانە ئاگادار مەکەنەوە. ئەوان کۆچیان کرد. ئەمرۆ ئەلقەیس لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی لەبەکر و تەغلەب هات و گەشتە ناو مناڵەکانی کەنانە. گومانی دەکرد ئەوان

منالەکانی ئەسەدن. شمشێری خستە نێوانیان و وتی: خرۆشان بێت خوێنی پاشا، خرۆشان بوو خوێنی پالەوان! پێیان وت: لەنفرین بەدور بیت، ئێمە خوێنبایی تۆ نین. ئێمە منالەکانی کەنانەین. بەدوای خوێنی خۆت برۆ و بیگرە چوونکە لەدوێنێوە رایان کرد. ئەو بەدوای منالەکانی ئەسەد غاریدا و ئەوان شەوانە لەدەست ئەو هەلاتن. لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| الا يا لهف نفسي اثر قوم | هم كانوا الشفاء فلم يصابووا |
| وقا هم جد هم ببني ابيهم | و بالاشقين ما كان العقاب |
| و افلتهن علباء جريضا | ولو ادركته صفر الوطاب |

واتاکەی: درێغ لەگەرانی گیانی من بەدوای ئەو هەلاتووانەی کە ئەگەر بەردەست دەکەوتن، دەبوونە هۆی باشبوونەوەی گیانی من و ئاگری تۆلە سەندنەوەی منیان دادەمرکاندنەوە بەلام درێغ کەرایان کرد. باوەگەورێی ئەوان منالەکانی باوکیان کردە قەلغانی ئەوان و لەناو دوو دەستە بەدبەخت، سزا بۆ بەدبەخت ترین دابەزی. عەلبا کەنزیك بوو کەوتە داوی لەناوچوون، ئەوانی رزگار کرد و لەچنگی منی دەرهێنا. ئەگەر ئەوم دەگرت، مەشکەکان لەشیرخالی دەبوونەوە ( دلی لوانلێو لەخەم خالی دەبوویەوە).

مەبەستی لە (کورانی باوکیان) منالەکانی کەنانەیە کەبوونە قەلغانی منالەکانی ئەسەد. چوونکە کەنانە و ئەسەد منالانی خەزیمەن و برای یەکتر. ئەوەی کەوتی: (صفر الوطاب) لەبەر ئەوەیە کەدەلێن: ئەویان کوشت و وشترەکانیان دزی و لەبەر ئەمە شیری ئەوان وشك بوو، یانی کۆتایی هات. دەستەیەك دەلێن: ئەویان کوشت و لەبەر ئەمە پێستی لەخوێن خالی بوویەوە.

دواتر ئەمرۆ ئەلقەیس بەدوای منالەکانی ئەسەد رایکرد و لەکاتی نیمەرۆ ئەوانی دۆزییەوە. لەم کاتەدا ئەسپ و سوارەکانی ئەو رووبەرووی مەرگ ببوونەوە و لەتینویەتی تەنگیان پێ هەلچنرا بوو. منالەکانی ئەسەد لای ئاوەکە جێگیر ببوون. ئەو شەری لەگەل ئەوان دەسپێکرد و زۆرێك لەم ناوەدا کوژران و منالەکانی ئەسەد

رایان کرد. دەمەو بەیانی، بەکر و تەغلەب لەبەدواداچونی ئەوان خۆیان بەدور گرت و وتیان: خوێنی خۆتت وەرگرت و تۆڵەی باوکت سەندەوە. وتی: نە بەخوا. وتیان: بەڵێ، بەلاّم تۆ پیاوێکی شووم و ڕقاویت. ئەوان لەکوشتنی منالّەکانی کەنانە پەشیمان بوونەوە و لەدەوری ئەو بلاّوەیان کرد. ئەو ڕۆشتە لای هۆزی شنوئە و داوای یارمەتی کرد. ئەوان هاوکاریان نەکرد و وتیان: ئەسەدییەکان برا و هاوسێی ئێمەن. ئەو لەناو ئەوان ڕۆشت ولەماڵی گەورەی مورسەد دابەزی. ئەو مورسەد ئەلخەیر کوڕی زی جودەن حێمەیری بوو. لەنێوان ئەواندا خزمایەتی بوو. داوای یارمەتی لێکرد و ئەو پێنسەد پیاوی شەڕکەڕی حێمەیری کردە هاورێ. مورسەد پێش کۆچ کردنی ئەمرۆ ئەلقەیس مرد و دوای ئەو پیاوێك بەناوی (قۆرمۆل) پاشایەتی گرتەدەست. ئەو توێشوی بەئەمرۆ ئەلقەیس دا و دواتر سوپاییەکانی کردە هاورێی و خەڵکانێکی بێ سەر وپێ لەعەرەبەکان شوێنی کەوتن. ئەو خەڵکانیتری لەهۆزەکانیتری عەرەب بەکرێ گرت و هاورێ لەگەڵ ئەوان هێرشی کردە سەر منالّەکانی ئەسەد و بەسەر ئەواندا زاڵ بوو.

دواتر مونزەر شوێن ئەمرۆ ئەلقەیس کەوت و لەدۆزینەوەی ئەو پێداگر و سوپای بۆ گرتنی ئەو بەرێ خست. ئەمرۆ ئەلقەیس توانای خۆراگری لەبەردەم ئەودا نەبوو و حێمەیرییەکان و هاورێکانیتری لەدەوری ئەو بلاّوەیان لێکرد. ئەو لەگەڵ ژمارەیەك رزگاری بوو و ڕۆشتە لای حارس کوڕی شەهابی یەربوعی باوکی عەتیبە کوڕی حارس. مونزەر کەسی بۆ لای ئەو نارد وئاگاداری کردەوە کەئەگەر ئەوان تەسلیم بەو نەکاتەوە، هێرش دەکاتە سەریان. ئەو، ئەوانی تەسلیم بەو کرد. ئەمرۆ ئەلقەیس هاورێ لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە کوڕی حارس و کچەکەی هند (کچی ئەمرۆ ئەلقەیس) و کەرەستە و کەل و پەلەکانی شەڕ و سامان و زرێکانی خۆی هەلاّت و رزگاری بوو. ڕۆشتە لای سەعد کوڕی زەبابی ئەیادی سەرەوەری خەڵکەکەی خۆی . ئەو ئەمرۆ ئەلقەیسی پەنا دا وئەمرۆ ئەلقەیس لەشێعر و هۆنراوەکانی خۆی بەپیاوەتی و جوامێری وەسفی کردووە. دواتر لای ئەو کۆچی کرد و لای مۆعەلی کوڕی تەمیمی تایی دابەزی و لای ئەو مایەوە. چەند وشترێکی بوو کەلەوان رۆژی خۆی بەدەست دەهێنا. لەم زەمانەدا دەستەیەك لەجەدیلە کەپێیان

دەوتن منداڵەکانی زەید، هێرشیان کردە سەر و وشترەکانیان تالآن کرد. منالّەکانی نەبهان بزنێکیان پێدا تا شیرەکەی بدۆشێت و نۆشی بکات. ئەو وتی:

**اذا ما لم ابل فنعز          كان قرون جلتها العصى**

واتاکەی: ئەگەر وشترێك نەبێت، بزنێك کاری ئەو دەکات....

ئەم بەیتانە درێژەی هەیە.

لەوێش کۆچی کرد و رۆشتە لای عامر کوری جوین. دەیویست دەست بەسەر سامان و کەسەکانی ئەمرۆ ئەلقەیسدا بگرێت. کاتێك لەئەندێشەکەی ئاگادار بوویەوە، پەنای بۆ پیاوێك لەمنالّەکانی سۆعەل بەناوی حاریسە کوری مۆڕ برد. ئەو پەنای بەئەمرۆ ئەلقەیس دا. لەئەنجامدا، لەنێوان عامر کوری جوین و پیاوی سۆعەلی شەڕ رویدا. کاتێك بینی لەسەر بوونی ئەو لەنێوان هۆزی تەی شەڕ دروست بووە، لای ئەوان کۆچی کرد و مەبەستی پیاوێکی یەهودی بەناوی سەمەئوال کوڕی عادیای کرد کە بەیاسای جولەکەکان رێزی لێگرت و پەنایدا. ئەمرۆ ئەلقەیس رۆژگارێکی درێژ (ئەوەندەی کە خوا ویستی ) لای ئەو مایەوە و دواتر داوای لێکرد نامەیەك بۆ حارس کوڕی ئەبی شەمێری غەسانی بنوسێت تا بیگەیەنێتە سزار. سەمەئوال ئەو کارەی کرد و ئەمرۆ ئەلقەیس رێگەی شوێنی مەبەستی گرتەبەر و بنەماڵە و کەل وپەلەکانی خۆی بەسەمەئوال سپارد. کاتێك گەشتە لای سزار رێزی لێگرت.

ئەم هەواڵە بەمنالّەکانی ئەسەد گەشت و ئەوان پیاوێکیان بەناوی تەماحیان نارد کەئەمرۆ ئەلقەیس براکەی کوشتبوو. پیاوی ئەسەدی کاتێك گەشت کەئەمرۆ ئەلقەیس بەرێکەوتبوو و سزار سوپایەکی گەورەی لەگەڵ دا ناردبوو کە لەناو ئەوان دەستەیەك لەشازادەکان دەبینران. کاتێك ئەمرۆ ئەلقەیس دوورکەوتەوە، تەماح بەسزاری وت: ئەمرۆ ئەلقەیس گومڕایەکی خراپەکارە. ئەو لەگەڵ کچەکەی تۆدا پەیوەندی هەبوو و نامە و نامە گۆڕینەوەیان لەنێواندا بووە و ئەمرۆئەلقەیس خۆی پێ دەگەیاند و چێژی لێوەردەگرت ( و بەئەگەری زۆر سکی پڕ دەکرد). ئەو لەبارەی کچ و وەسف کردنی جوانییەکانی ئەو، چەندین شێعری هۆنییەوە کەکچەکەی لەناو

عەرەبەکان ریسوا کرد( تۆمەت بوو یا راست؟ لە ئەمرۆ ئەلقەیس کەگەنجێکی قۆز و خۆش رابوێر و ژن خۆشەویست و جوان پەرەست بوو و هەموو ژیانی لەباوەشی مانگ روخسارەکاندا بەسەر بردبوو، دور نەبوو). سزار جلێکی رازاوەی بەزێر چنراوی ژەهراوی بۆ نارد و بۆی نوسی: ئەو جلانەی خۆم لەبەرم دەکرد بۆ رێز لێنان بۆ تۆم نارد. لەبەری کە و هەوالّەکان شوێن بەشوێن بۆ من بنێرە. ئەمرۆ ئەلقەیس شادمان بوو و لەبەری کرد. ژەهر بەخێرایی کاریگەری لەسەر جەستەی دانا و پێستی دارزی و لەبەر ئەمە بەبریندار ناویان دەبرد. ئەو لەمبارەوە وتی:

لقد طمح الطماح من نحو ارضه    ليلبسني مما يلبس ابووسا
فلو انها نفس تموت سويه    و لكنها نفس تساقط انسا

واتاکەی:

تەماح لەسەرزەمینی خۆی کۆچی کرد تا من لەنێوان ئەوەی دەپۆشێت، دەرد و ئازار بپۆشێت. خۆزگە ئەمە گیانێك بووایە بەتەنیایی و بەرابەری بەلاّم گیانێکە، گیانی فراوانی بەدوادا دادەرِمێت.

کاتێك گەشتنە شوێنێك لەخاك رۆم کەبەئەنقەرە (ئەنکارا) ناویان دەبرد، وتی: چەند زۆرن وتارە ئاشکراکان، گورزە کاریگەرەکان، کەدەمێنێتەوە بەیانی لەئانکارا. ئەو ئارامگای ژنێکی لەشازادەکان بینی کە لەقەراغ کێوی عەسیبەب بەخاك سپێردرابوو. لەبەر ئەمە وتی:

اجارتنا ان الخطوب تنوب    و انی مقيم ما اقام عسيب
اجارتنا انا غريبان هاهنا    و كل غريب للغريب نسيب

واتاکەی: ئەی هاوسێی من، پێشهاتی گیان برِ و بەئازار بەردەوام دەگەن و من تا کاتێك ئەم کێوە لێرەدا پایەدار بێت، دەمێنمەوە. هاوسێی من، ئێمە هەردوك لێرە بێ ئاشنایین. هەر بێ ئاشنایەك خزمی بێ ئاشناکانە.

ئەوسا مرد و لەپالّ ئارامگای ئەو ژنە بەخاك سپێردرا.

کاتێك ئەمرۆ ئەلقەیس مرد، حارس کوڕی ئەبی شێمری غەسانی رۆشتە لای سەمەئوال کوڕی عادیا و داوای کەل و پەلەکانی ئەمرۆ ئەلقەیسی کرد. سەد زرێ و برێك سامانی جۆراوجۆر بوو. سەمەئوال ئەوانی نەدایەوە. حارس یەکێك لەکوڕەکانی سەمەئوالی گرت و وتی: یا کەل و پەلەکانت تەسلیم دەکەیتەوە یا کوڕەکەت سەر دەبڕم. سەمەئوال نەیدایەوە. ئەو کوڕەکەی سەربڕی و باوك لە پرسەی کوڕەکەی ئەمەی وت:

وفيت بـا درع الكندى | اذا ما ذم اقوام وفيت
و اوصى عاديا يوما بان لا | تهدم سا سموال ما بنيت
بنى لى عاديا حصنا حصينا | و ما كلما شئت استقيت

واتاکەی:پارێزگاریمان لە کەل و پەلی شازادەی کێندی کرد، بەڵێ لەو شوێنەی کەسانیتر پشت بەسەرزەنشت کردن دەبەستن، من پشت بەپایەداری لەهاوڕێیەتی دەبەستم. رۆژێك باوکم عادیا پێی راسپاردم کەئەی سەمەئوال ئەوەی من دروستم کردووە، تۆ خاپوری نەکەیت. عادیا بورجێکی بەهێزی بۆمن دروست کرد و ئاوێکی رەوان کرد کە هەرکات بمەوێت لێی دەخۆمەوە.

ئەعشایش ئامازەی بەم روداوە داوە. دەڵێت:

كن كالسموال اذطاف الهمام به | فى جحفل كسواد الليل جرار
اذ سامه خطتى خسف فقال له | قل ما تشأ فانى سامع حار
فقال غدرو ثكل انت بينهما | فاختر فما فيهما حظ لمختار
فشك غير طويل ثم قال له | اقتل اسيرك انى مانع جارى

واتاکەی: هاوشێوەی سەمەئوال بە کاتێك پیاوێکی مەترسیدار لەگەڵ سوپایەکی قورس و رەشی وەك شەو هێرشی کردە سەر و ویستی خوێنی برێژێت. کاتێك دوو بەرنامەی سەخت و مەترسیداری پێ پێشنیار کرد و ئەو وتی: هەرچیت ئەوێ بڵێ

من بەگوێی گیان گوێت لێ ئەگرم. وتی: یاخیانەت یا جەرگ سوتان. هەرکامیانت ئەوێت و لەهەرکامیان سود دەبەیت هەڵبژێرە، لەم کارەدا ئازادی. ئەو کەمێك درەنگی کرد و وتی: دیلەکەی خۆت بکوژە چوونکە من پارێزەی پەناهێنەرەکەی خۆمم.

## شەڕی خەزاز

داستانەکە بەم شێوە بوو: یەکێك لەپاشاکانی یەمەن چەندین ئەسیری لەهۆزەکانی مۆزێر و رەبیعە و قوزاعە لەدەستدا بوو. دەستەیەك لەگەورەکانی موعد بەمیوانی ڕۆشتنە لای. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: سەدوس کوڕی شەیبان کوڕی زوهەل کوڕی سەعلەبە، عەوف کوڕی موحەلیم کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان، عەوف کوڕی عەمرۆ کوڕی جوشەم کوڕی رەبیعە کوڕی زەید مەنات کوڕی عومەر زەحیان. پیاوێك لەبەهرا بەناوی عوبەید کوڕی قەراد کەلەناو دیلەکاندا بوو، چاوی بەوان کەوت. ئەو وتار خوێن بوو. داوای لەوان کرد هاورێ لەگەڵ ئەو کەسانەی داوای ئازادی ئەوانیان دەکرد، ناو ببەن. ئەوان سەبارەت بەدیلەکان و ئەو لەگەڵ پاشا قسەیان کرد. پاشا هەموویانی بەوان بەخشی. عوبەید کوڕی قەرادی بەهراوی وتی:

| | |
|---|---|
| نفسی الفداً لعوف الفعال | و عوف و لا بن هلال جشم |
| تداركنی بعد رما قد هوي | ت مستمسكا بعراقی الوذم |
| و لولا سدوس وقد شمرت | بی الحرب زلت بنعلی القدم |
| و نادیت بهراً كی یسمعوا | و لیس باذانهم من صمم |
| و من قبلها عصمت قاسط | معدا اذا ما عزیز ازم |

واتاکەی: گیانی من فیدای عەوفی چاکەکار کوڕی موحەلیم و عەوفی کوڕی عەمرۆ و جەشم کوڕی هیلال بێت. کاتێك منی گرتەوە کەکەوتمە هەڵدێر و دوو لێواری روبارم بینی و بەپەتێکی هەڵواسراو ئاوێزان بووم. ئەگەر لەکاتی بڵێسە

سەندنی ئاگری شەڕ، سەدوس منی نەگرتبوویەوە، هەنگاوکانی من دەخلیسکان. من هاوارم لەبەرهاوییەکان کرد تا ببیستن و گوێچکەی ئەواندا گران و کەڕ نەبوو. پێش ئەوە ڤاست، مەعدی چاودێری دەکرد و ئەمە لەکاتێکدا بوو پیاوێکی بەرێز بەرەو بێ رێزی هەنگاوی دەنا.

پاشا دوای ئەوە دەستەیەك لەمیوانەکانی وەك بارمتە لای خۆی راگرت و بەوانیتری وت: سەرۆك و گەورەکانی خۆتان بێنە لای من تا بەڵێنی فەرمان بردنیان لێ وەربگرم و گەرنە هاورێیانی ئێوە دەکوژم. ئەوان بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە و ئەم هەواڵەیان پێ راگەیاندن. لەم کاتەدا کولەیب کوڕی وایل پەیکی بۆ لای رەبیعە نارد و ئەوانی کۆکردەوە. مەعدیش پەیوەستیان بوو و ئەمە یەکێك لەو کەسانە بوو کەمەعدییەکان لەدەوری کۆدەبوونەوە بەهەمان شێوە کە لەداستانی کوژرانی کولەیب ئاماژەی پێدەدەین. کاتێك لەدەوری ئەو کۆبوونەوە، ئەوانی لەگەڵ خۆیدا برد. سەفاحی تەغلەبی فەرمانەدەی پێشەنگاکانیان بوو. ئەو هەمان سەلەمە کوڕی خالید کوڕی کەعب کوڕی زوهەیر کوڕی تیم کوڕی ئوسامە کوڕی مالك کوڕی بەکر کوڕی حەبیب کوڕی تەغلەب بوو. فەرمانی بەواندا لەسەر خەزاز ئاگر بکەنەوە تا بتوانن بڕۆنە ئەوێ. خەزاز ناوی کێوێکە لەتێخفە لەنێوان بەسرە تامەککە. ئەم کێوە نزیکە لەکوێستانی سالع. پێی وت: ئەگەر دوژمن گەمارۆیدان، دو ئاگر بکەرەوە. هەواڵی کۆبوونەوە و رەوانە بوونی رەبیعە بەگوێی مەزجەح گەشت. ئەمان لەگەڵ سوپاکەی خۆیان هاتن و هۆزەکانی نزیك خۆیان بۆ شەڕ هاندا و بۆ شەڕی دوژمن ڕۆشتن. کاتێك خەڵکی تەهامە لەهاتنی مەزحەجییەکان ئاگادار بوونەوە، پەیوەستی رەبیعە بوون. مەزحەجییەکان شەوانە ڕۆشتنە کوێستانی خەزاز. سەفاح دوو ئاگری کردەوە. کاتێك کولەیب دوو ئاگرەکەی بینی، بەرەو لای ئەوان غاریدا و بەرەبەیان هێرشی کردە سەریان. لەکوێستانی خەزاز چاویان بەیەك کەوت و شەڕێکی سەخت رویدا کەژمارەیەکی زۆر تیایدا کوژران. مەزحەجییەکان شکستیان خوارد و سوپاکەیان هەڵوەشایەوە. سەفاح لەمبارەوە وتی:

و لیلة بت او قد فی خزاز — هدیت کتائبا متحیرات
ضللن من السهاد و کن لولا — سهاد القوم احسب هادیات

واتاکەی: ئەو شەوە بیر بێنەرەوە کە لەکوێستانی خەزاز رۆژم کردەوە و فەرماندەیی سەربازە سەرگەردانەکانم دەکرد. لەبێ خەویدا گومڕا ببوون و باوەڕی من وایە ئەگەر بێ خەوی نەدەبوو، سەرگەردان و گومڕا نەدەبوون

فەرزدێقیش بۆ سەرزەنشت کردنی جەریر دەڵێت:

**لولا فوارس تغلب ابنة وائل　　دخل العدو عليك كل مكان**
**ضربوو الصنائع و الملوك و اوقدوا　　نارين اشر فتا على النيران**

واتاکەی: ئەگەرسوارەکانی تەغلەب کوڕی وایل نەدەبوون، دوژمن لەهەر لایێکەوە هێرشی دەکردە سەر تۆ. لەپەروەردە کراوان و پاشاکان، دوو ئاگریان کردەوە کە لەهەموو ئاگرەکان بەرزتر بوون.

دەستەیەك دەڵێن: کەس نەیزانی کە لەشەڕی خەزاز چ کەسێك سەرکردە بوو چوونکە عەمرۆ کوڕی کەلسوم کەکوڕی کچی کولەیبە، دەڵێت:
**و نحن غداة اوقد فى خزاز　　رفدنا فوق رفد الرافدينا**

واتاکەی: ئێمە لەو پێگەی کەئاگری خەزاز تیایدا هەڵکرا، زیاتر لەهەموو کەسانیتر هاوکاری هاورێکانی خۆمانمان کرد.
ئەگەر باوەگەورێی ئەو سەرکردەی ئەو سوپایە دەبوو، بەم شێوە شانازی بەخۆی نەدەکرد کەیارمەتی داوە. جیاواز لەوە ئەو کەسانەی لەخەزاز کۆببوونەوە بەهاودەست و هاوپشت ناودەبات و دەڵێت:

**فكنا الا يمنين اذا التقينا　　و كان الا يسرين بنو ابينا**
**فصالو صولة فيمن يليهم　　وصلنا صولة فيمن يلينا**

واتاكەی: كاتێك چاومان بەیەك كەوت و شەڕ رویدا، ئێمە لای راست بووین و براكانمان لای چەپی لەشكر. ئێمە لەناو دەوروبەرەكەی خۆمان هێرشمان دەسپێكرد و ئەوانیش لەناو دەوروبەرەكەی خۆیان هێرشیان دەست پێكرد.

پێیان وت: تۆ خۆت بە لەپێشتر لەبرادەرانت یانی موزێر دانا. چوونكە لەهۆنراوەیەك باسی باوەگەورێی خۆی دەكاتەوە و دەڵێت:

و منا قبله الساعی كلیب　　　فای المجد الا قد و لینا

واتاكەی: پێش ئەو كۆشەرە تێكۆشەرە، كولەیب لەناو ئێمەدا بوو. هیچ رێزدارێك نەبوو مەگەر بەسەریدا زاڵ بووین.

ئەو ئاماژەی بەفەرماندەیی باوەگەورێی خۆی وایل نەداوە و نەمە باشترین شتێك بوو دەیتوانی شانازی پێوە بكات.

## کوژرانی کولەیب و شەڕەکانی نێوان بەکر و تەغلەب

گفتوگۆ سەبارەت بەشەڕی نێوان بەکر و تەغلەبە کەکوڕەکانی وایلن.

ئەژادنامەی وایل بەمشێوەیە: وایل کوڕی هێنب کوڕی ئەفسا کوڕی دەعما کوڕی جەدیلە کوڕی ئەسەد کوڕی رەبیعە کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان. ئەم شەڕە لەسەر کولەیب رویدا کە ناو و نیشانی بەم شێوەیە: وایل کوڕی رەبیعە کوڕی حارس کوڕی زوهەیر کوڕی جەشم کوڕی بەکر کوڕی حەبیب کوڕی عەمرۆ کوڕی غەنەم کوڕی تەغلەب. لەبەر ئەوەی پێیان دەوت کولەیب (سەگی بچوك) چوونکە کاتێك بەرێ دەکەوت، تولە سەگێکی لەگەڵ خۆیدا دەبرد و کاتێك دەگەشتە شوێنێکی خۆش یا باخێك، لەتوڵە سەگەکەی دەدا و دواتر لەوێ فڕیدەدایە سەر زەوی و تولە سەگ دەیقروسکاند و دەیزوزاند و هەر کەس دەنگی قورسکەی ببیستایە، لەوێ دوردەکەوتەوە و نزیك ئەوێ نەدەکەوتەوە. پێیان وت کولەیب وایل و دواتر کورتیان کردەوە و بەکولەیب ناویان برد. ئاڵای رەبیعە کوڕی نزار لەناو کوڕە گەورەکەی ئەودا دەسوڕا و دوای ئەو بەکوڕە گەورە دەگەشت. ئاڵا لەدەست عەنەزە کوڕی ئەسەد کوڕی رەبیعە بوو. ئایینی ئەوان بەشێوەیەك بوو کەریشی خۆیان بە رەنگی زەرد رەنگ دەکرد و سمێڵی خۆیان کورت دەکردەوە. کەسانیتر ئەم کارەیان نەدەکرد مەگەر ئەوانەی لەگەڵ ئەمان نەدەسازان و مەبەستی شەڕی ئەمانیان دەکرد. دواتر ئاڵا کەوتە دەست عەبد ئەلقەیس کوڕی ئەفسا کوڕی دەعما کوڕی جەدیلە کوڕی ئەسەد کوڕی رەبیعە کوڕی نزار. ئەریتی ئەوان بەمشێوە بوو: ئەگەر کەسێك جوێنی پێ دەدان، شەقەزللەیان لەروخساری دەدا و ئەگەر کەسێکم شەقە زللەی لێدەدان دەیانکوشت. دواتر ئاڵا کەوتە دەست ئەمر کوڕی قاست کوڕی هەنب. شێوەی ئەوان بەشێوەیەك هاوشێوەی پێشینانیان بوو. ئەوسا ئاڵا کەوتە دەست بەکر کوڕی وایل. ئەمان کەسانیتریان بەبیانوی جوجکە باڵندەیەك دەرەنجاند. جوجکەیان لەسەر چاڵێك لەشوێنێکی بەرزدا دەبەستەوە و هەرکەس بەمەی دەزانی لەو رێگاوە نەدەرۆشت. ئەوانەی دەیانویست هاتوچۆ بکەن لەچەپ و راستی ئەو رێگاوە

دەڕۆشتن. دواتر ئالاّ بەتەغلەب گەشت. ئەو ئالاّکەی دایە دەست وایل کوڕی رەبیعە. شێوازی ئەو بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا، راگرتنی تولە سەگ بوو.

مەعدییەکان زیاتر لەسێ کەس لەدەوری کەسێتر کۆنەبوونەوە: یەکیان عامر کوڕی زەریب کوڕی عەمرۆ کوڕی بەکر کوڕی یەشکور کوڕی حارس یانی عەدوان کوڕی عەمرۆ کوڕی قەیسی عەیلان و ئەو هەمان ئوناس کوڕی موزێر و براکەی ئەلیاس کوڕی موزێر بوو. کاتێك مەعدییەکان پەیوەستی مەزحەج بوون و رۆشتنە تەهامە، ئەو سەرکردەیان بوو. ئەمە یەکەم دەرگیری لەنێوان تەهامە و یەمەن بوو. دووەم رەبیعە کوڕی حارس کوڕی مەر کوڕی زوهەیر کوڕی جەشم کوڕی بەکر کوڕی حەبیب کوڕی کەلب بوو. ئەو لەرۆژی شەڕی سولان کە لەنێوان تەهامە و یەمەن رویدا، فەرماندەی مەعدییەکان بوو. سێیەم کەس وایل کوڕی رەبیعە بوو. ئەو لەرۆژی شەڕی خەزاز فەرماندەی مەعدییەکان بوو و سوپای یەمەنی بلاّوە پێکرد و تێکی شکاند. مەعدییەکان بەهرەی پاشایەتی و تاج و فەرمانبەری ئەویان بەودا و ئەو رۆژگارێك مایەوە. دواتر گەردن کێشی و لەخۆبایی بوونی کردە پیشە و ستەمی لەخەلکەکەی کرد. بێدادی ئەو گەشتە شوێنێك کە لەبەهاران شوێنی باران بارینی تایبەت دەکرد بەخۆی و کەس لەوناوەدا مەڕ یا ئاژەلّی نەدەلەوەڕاند. دەیوت: ئاژەلاّنی دەشتی و کێوی ئەم یا ئەو زەمینە لەژێر پارێزگاری مندایە و کەس لەوێ راوی نەدەکرد. کەس وشتری خۆی لەلەوەڕگاکانی ئەودا نەدەلەوەڕاند. بەئاگری ئەو ئاگری نەدەکردەوە، لەناو مالّەکانی ئەودا هات و چۆی نەدەکرد، و لەو شوێنەی ئەو دانیشتبوو، چوارمەشقی دانەدەنیشت.

منالّەکانی جەشم و منالّەکانی شەیبان تێکەلاّوانی یەك مالّ بوون و یەك مەبەستیان بووە چوونکە دەیانویست یەکیەتی خۆیان رابگرن و دەترسان کە لەناو ئەوان جیایی و دوبەرەکی بکەوێتەوە. کولەیب لەگەلّ جەلیلە کچی مورە کوڕی شەیبان کوڕی سەعلەبە خوشکی جەساس کوڕی موڕ پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. جارێك لەسەرەتای بەهار کولەیب زەمینێکی لەپانتاییەکان کردە پاسگای خۆی تا کەس نەڕواتە ئەوێ و ئاوی لێ نەبات و راوی تیا نەکات و ئاژەلّ و مەر و مالاّت نەلەوەڕێنێت. جگە لەو کەسەی مەبەستی شەڕی بوو، کەس نەدەڕۆشتە ئەوێ.

ئەوسا پیاوێك كەسەعد كوڕی شومەیس كوڕی تەوق جەرەمیان پێ دەوت، ڕۆشتە لای بەسۆس كچی مونقزی تەمیمی پوری جساس كوڕی مورە. ئەم جەرمیە وشترێكی بوو بەناوی سەراب كە لەسەرەوەی وشترەكانی جساس دەلەوەڕا. ئەمە هەمانە كەعەرەبەكان نمونەی پێ دەهێننەوە و دەڵێن شووم تر لەسەراب و شوومتر لەبەسۆس.

ڕۆژێك كولەیب ڕۆشتەدەر تا سەر لەوشتر و لەوەڕگاكانی بدات. لەوێ دەستی بەهاتوچۆ كرد. وشترەكانی ئەو تێكەڵ بەوشترەكانی جساس بوون. كولەیب سەیرێكی سەرابی كرد و بە ناناشنای بینی. جساس پێی وت: ئەمە وشتری دراوسێكەمان جەرمیە. كولەیب وتی: ئەم وشترە جارێكیتر نەیێتە ناو ئەم لەوەڕگایە. جساس وتی: وشترەكانی من بۆ هەر شوێنێك بڕۆن، ئەم وشترە لەگەڵیانە. كولەیب وتی: ئەگەر جارێكیتر بێتە ئێرە تیری خۆم لەگوانی دەچەقێنم. جساس وتی: ئەگەر تیر لەگوانی بچەقێنیت، ڕمەكەی خۆم لەسینەت دەچەقێنم. ئەو دووانە لەیەك جیابوونەوە. دواتر كولەیب بەژنەكەی وت: ئایا لەناو عەرەب كەسێك دەناسیت پەنابەری خۆی لەبەرابەر مندا بپارێزێت و لەسەر ئەم كارە شەڕ لەگەڵ من بكات؟ ژن وتی: جگە لەجساس كەس بەم خوو و عادەت و پیاوەتییە ناناسم. كولەیب داستانەكەی بەژنەكەی وت. لەوەدوا هەر كات كولەیب دەیویست بڕواتە دەر و لەوەڕگاكەی خۆی، ژنەكەی ڕێگەی لێدەگرت و سوێندی دەدا پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕێنێت. داوای لەبراكەی خۆیشی جساس دەكرد وشترەكانی بەرەڵا نەكات و ئاژاوە نەنێتەوە.

كولەیب رویكردە لەوەڕگاكەی خۆی و سەیری وشترەكانی كرد. مێچكە وشتری پیاوی جەرمی بینی و تیری لەگوانی چەقاند. وشتر بەهاوار هەڵات و ڕۆشت و لای ماڵی خاوەنەكەی ئارامی گرت. كاتێك خاوەنەكەی ئەمەی بینی، فریادی ریسوایی و تۆڵە سەندنەوەی بەرز كردەوە. بەسۆس هاواری دراوسێكەی خۆی بیست و هاتەدەر و كاتێك وشتری لەو حاڵە بینی، دەستی خستەسەر سەرو و قیژاندنی: هاوار لەم ئابڕو چوونە! جساس ئەوی دەدی و هاواری ئەوی دەبیست. ڕۆشتە لای ئەو وتی: ئەی ژن! ئارام بە و مەگری. جەرمیشی ئارام كردەوە. بەو دووانەی وت: بەم زوانە

وشترێکی گەورەتر لەمە دەکوژم. بەم زوانە (غلال) (گرانبایی) دەکوژم. غلال ناوی وشترێکی نێر و بەهێز لەکولەیب بوو کەلەو رۆژگارەدا وێنەی نەبوو. ئەو لەوتەکەی خۆی کولەیبی لەدڵدا دەست نیشان کردبوو. کولەیب سیخورێکی بوو کەوتەکانی ئەوی بیست. کولەیبی ئاگادار کردەوە. کولەیب وتی: ترسی نییە. ئەو لەسوێندەکەی خۆی بەغلال بەسەندەی کردووە. جساس لەوەدوا بەردەوام دەگەڕا تا ئەو لەشوێنێکدا بەتەنیا و بێ پاسەوان ببینێت و بەشێوەیەك بەسەر ئەودا زاڵ بێت. رۆژێك کولەیب هاتەدەر و کاتێك لەماڵەکان دورکەوتەوە جساس سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و ڕم لەدەست خۆی بەکولەیب گەیاند. کولەیب وەستا. جساس پێی وت. ڕمم لەسەر پشتت داناوە! کولەیب وتی: ئەگەر راست بکەیت لەپێشەوە رووبەرووم دەبیتەوە. کولەیب سەیری نەکرد. جساس رمی لێدا و ئەوی لەئەسپەکەی خستە خوار. کولەیب وتی: ئەی جساس، شەربەتێك بەمن بگەیێنە. جساس هیچی پێ نەدا. کولەیب گیانی دا. جساس فەرمانیدا بەپیاوێك بەناوی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان تا چەند بەردێك لەسەر پەیکەرەکەی دانێت بۆ ئەوەی ئاژەڵە دڕندەکان نەیخۆن.

موهەلهیل کوڕی رەبیعە برای کولەیب لەمبارەوە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| قتيل ما قتيل المرْ عمرو | و جساس بن مرة ذى صريم |
| اصاب فؤادة باصم لدن | فلم يغطف هناك على حيمم |
| فان غدا و بعد غد لرهن | لامر ما يقام له عظيم |
| جسيما ما بكيت به كليبا | اذا ذكر الفعال من الجسيم |
| ساشرب كاسها صرفا و اسقى | بكاس غير منطقة مليم |

واتاکەی: درێغ لەکوژراوی دوو پیاو کەعەمرۆ کوڕی حارس و جەساس هەڵگری پاسگا بوون. دڵی ئەوی بەڕمی گیان بڕ کون کرد و رێزی لەپەیوەندی خزمایەتی نەگرت. بەیانی و رۆژەکانی دوای ئەوە لەگرێوی کارە گەورەکانن کەپیاوە گەورەکان پێی هەڵدەستن. کاتێك کارە گەورەکانی کولەیب بیر دێنمەوە، بەخەستی بۆی دەگریم و شین دەکەم. بەخێرایی بادەی نابی ئەو بەیەك قوم دەخۆمەوە و

پیاڵەیەکی سەر کراوە و سەر کۆنە نەکراو لەمردنی ئەو هەڵدەدەم.

کاتێك جساس، کولەیبی کوشت، سوار لەسەر ئەسپ گەڕایەوە بەشێوەیەك جلەکانی تا سەروی ئەژنۆی هەڵکشا بوون. کاتێك باوکی مورە ئەمەی بینی، وتی: جەساس کارێکی گەورەی کردووە. تا ئەمرۆ ئەوم بەئەژنۆی روت نەبینبوو. کاتێك لای باوکی وەستا، باوکی وتی: ئەی جەساس، چیت بەسەر هاتووە؟ جەساس وتی: گورزێکم وەشاند کەبەیانی کوڕەکانی وایل بەدەم سەما کردنەوە لێی کۆدەبنەوە. پرسی: گورزت لەکێ دا دایکت بۆ پرسەت دانیشێت! وتی: کولەیبم کوشت. وتی: بەراستی؟ وتی: بەڵێ. باوك وتی: کارێکی خراپت کرد و بارێکی قورست خستەسەر شانی خەڵکەکەت. جەساس وتی:

| | |
|---|---|
| تـأهب عنك اهبة ذى امتنـاع | فان الامر جل عن التلاحى |
| فانى قد جنيت عليك حربـا | تغص الشيخ بـالمـأ القراح |

واتاکەی: بەشێوەیەك کەپیاوانی بەهێز و رێز لێگیراو ئامادە دەبن، ئامادەی کارێکی دژوار بە کەئەم کارە لەدوژمنایەتی یەکتر و جنێودان بەیەکتر تێپەڕی کردووە. من شەڕێکی قورسم گیرۆدەی تۆ کردووە کەئاوی بەتام لەقورگی پیرەپیاوی شارەزا دەگیرێنێت.

کاتێك باوکی بیستی، ترسا لەوەی خەڵکەکەی دەست لەیارمەتی دانی ئەو هەڵبگرن. لەبەر ئەمە وتی:

| | |
|---|---|
| فان تك قد جنبت على حربـا | تغص الشيخ بـالمـأ القراح |
| جمعت بهـا يديك على كليب | فلا و كل و لارث السلاح |
| سـالبس ثوبهـا و اذود عنى | بهـا عـار المذلة و الفضـاح |

واتاکەی: ئەگەر شەڕێکی گیرۆدەی من کردووە کەئاو لەقورگی پیرەپیاوی شارەزادا دەگیرێنێت، ئەگەر دەستەکانی خۆت بەسەر کولەیبدا زاڵ کرد، ئەتۆ لەحاڵی خۆتدا دەهێڵمەوە ئەکەل و پەلێکی شەڕی بێ نرخ و کۆنم هەیە. بەخێرایی جلی شەڕ لەبەر دەکەم و بەم کارە جل وبەرگی ریسوایی لەخۆم دوردەکەمەوە.

ئەوسا مورە داوای هاوکاری لەخەڵکەکەی کرد و خەڵکەکەی وەڵامیان دایەوە و ڕمەکانیان درەخشان و شمشێرەکانیان تیژ و ئامادە کرد و ڕۆشتن بۆ شوێنی کۆبوونەوەی کەسەکانی خۆیان.

لەم زەمانەدا هەمام کوڕی مورە برای جەساس و موهەلهیل برای کولەیب پێکەوە شەرابیان دەخوارد. جەساس کەنیزێکی نارد و هەمامی ئاگادار کردەوە. کەنیز ڕۆشتە لای هەمام و بۆ سوچێکی بانگ کرد و ئاگاداری کردەوە. موهەلهیل پرسی کەنیز چی بەتۆ وت؟ لەنێوان ئەم دووانەدا پەیمانێك بوو کەهیچ شتێك لەیەك نەشارنەوە. هەمام هەواڵی کەنیزەکەی پێ وت. ئەو ویستی ئەمە بەگاڵتەوە پێکەنین بەموهەلهیل بڵێت. موهەلهیل وتی: قنی براکەی تۆ تەنگتر لەوەیە بتوانێت ئەم کارە بکات! ئەو دووانە دەستیان بەخواردنەوە کردەوە. موهەلهیل وتی: بخۆرەوە کەئەمرۆ بادەیە و بەیانی کار. هەمام خواردییەوە بەڵام ئاگادار و ترساو بوو. کاتێك موهەلهیل مەست بوو، هەمام گەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی. لەهەمان ساتدا هەموویان ڕۆشتنە شوێنی کۆبوونەوەی کەسەکانی خۆیان. هەواڵی کوژرانی کولەیب لەهەموو شوێنێکدا بلاو بوویەوە و کەسەکانی ڕۆشتن تابەخاکی بسپێرن. کاتێك بەخاك سپێردرا، یەخەکان دڕان و روخسارەکان روشێنران و کچان و پەردە نشینان و ژنانی جوان بەرەو لای ڕۆشتن و شینیان کرد. ژنان بەخوشکی کولەیبیان وت: جەلیلە خوشکی جەساس لەناو ئێمەدا دەرکە چوونکە مانەوەی ئەو دەبێتە هۆی شەرم و سەرزەنشتی ئێمە. جەلیلە وەك ئامازەمان پێدا ژنی کولەیب بوو. خوشکی کولەیب پێی وت: لەناو ئێمە بڕۆدەر چوونکە تۆ خوشکی کوژەری ئێمە و هاوتای دڵ سوتێنەری ئێمەیت. ئەو ڕۆشتەدەر و لەم کاتەدا باوکی مورە چاوی پێی کەوت و پێی وت: چ هەواڵێکت پێیە؟ جەلیلە وتی: جەرگ بڕانێکی زۆر، خەمێکی هەمیشەیی، نەمانی هاوڕێیان، کوژرانی برایەکی بەرێزتر لەگیان لەبەیانیدا. لەناو ئەم و ئەودا رق دەچێنن و خوێنەکان دەرێژن. پێی وت: ئایا هەمووی ئەمانە بەلێبووڕین و گەورەیی و دانی خوێنبایی بەریسوایی، ناتوانێت دایانمرکێنێتەوە؟ جەلیلە وتی: سوێند بەخوای کەعبە کەئارەزوییەکی هەڵخەڵەتێنەرە. ئایا تەغلەب لەبەرابەر چەند وشتر خوێنی خاوەنەکەی بەتۆ دەبەخشێت؟

کاتێك جەلیلە ڕۆشت، خوشکی کولەیب وتی: کۆچ کردنی جوێندەر و دووری بێدادگەر. هاوار لەبنەماڵەی مورە لەهاتنە بەردەوامەکان. قسەکەی بەگوێی جەلیلە گەشت. ئەو وتی: چۆن ژنێکی ئازاد لە لەناوچونی بارەگا وچاوەڕوانی کردنی تۆڵەسەندنەوە، هۆکاری سەرکۆنە کردن ئامادە دەکات؟ خوا خوشکەکەم بەختەوەر بکات، بۆچی نەیوت: ڕەم کردنی شەرمی ژنان و ترسی دوژمنان. دواتر ئەم شێعرانەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| یا ابنتة الاقوام ان لمت فلا | تعجلی باللوم حتی تسألی |
| فاذا انت تبینت الذی | یوجب اللوم فلومی واعذلی |
| ان تکتن اخت امرئ لیمت علی | شفق منها علیه فافعلی |
| جل عندی فعل جساس فیا | حسرتا عما انجلی او ینحلی |
| فعل جساس علی وجدی بة | قاطع ظهری و مدن اجلی |
| لو بعین فقئت عین سوی | اختها فانفقئت لم احفلی |
| تحمل العین قذی العین کما | تحمل الام اذا ما تفتلی |
| یا قتیلا قوض الدهر بة | سقف بیتی جمیعا من عل |
| هدم البیت الذی استحدثته | و سعی فی هدم بیتی الاول |
| ورمانی قتله من کثب | رمیة المصمی به المستاصل |
| یا نسائی دو نکن الیوم قد | خصنی الدهر برزْ معضل |
| خسنی قتل کلیب بلظی | من ورائی و لظی مستقبل |
| لیس من یبکی لیومیه کمن | انما یبکی لیوم مقبل |
| یشتفی المدرك بالثأرو فی | درکی ثأری ثکل المثکل |
| لیته کان دما فاحتلبووا | دررا منه دمی من اکحل |
| اننی قاتلة مقتولة | و لعل الله ان یرتاح لی |

واتاکەی: ئەی کچی جوانی شارسان، ئەگەر دەتەوێت سەرکۆنە بکەیت، لەم کارەدا پەلە مەکە تا بەتەواوی لەداستانەکە بپرسیت و ژێر و روی ئەم کارەت بۆ دەرکەوێت. کاتێك ئەوەی بەهۆکاری سەرکۆنە کردنی ئەزانی بەباشی لێکدانەوەت بۆ کرد، هەرچەندە دەتوانی سەرکۆنە بکە وسەرزەنشتیش. ئەگەر ئەم کارە لەسەر ئەوە

سوڕاوە کەخوشکی پیاوێك لەداخی ئەو گیان بدات، تۆیش ئەم کارە بکە و گیان بدە. کاری جەساس لای من زۆر گرانە، ئێستا دریغ لەوەی رویداوە و لەو دواهاتانەی رودەدات. کاری جەساس بەو هەموو نزیك بوونەوەی من لەو، نزیك کەرەوەی مەرگی من و شکێنەری پشتی منە. ئەگەر لەم روداوە، لەبەرابەر کوێر بوونی یەك چاو، چاوێکیتر جگە لەهاوتای ئەو کوێر دەبوو، من ترسم نەبوو. چاو گژ وگیا لەخۆیدا بە ئازار دەبینێت بەهەمان شێوە کاتێك دایك منالّ لەشیر دەگرێتەوە، لەجیاتی ئەو منالّە رەنج دەبات.

ئەی کوژراوێك کەرۆژگار بەمەرگی ئەو سەقفی هەردوو مالّەکەمی بەسەردا وێران کردم و بەسەر مندا دایرماند، مالّێك کەتازە دروستم کردبوو، خاپوری کرد و ئێستا هەولّ دەدات مالّە کۆنەکەیشم وێران بکات. مەرگی ئەویش لەنزیکەو تیری بۆ من هاویشت، بەشێوەیەك تیر بۆ ئاسکێك بهاوێژن و لەجێگەی خۆیدا ساردی بکەنەوە، بەشێوەیەك رەگ و ریشەی کەسێك دەربێنن. ئەی ژنانی هاوتای من، ئەمرۆ رێزی من بگرن کەرۆژگار داغێکی جەرگ بڕی لەسەرمن بەجێهێشت. کوژرانی کولەیب ئاگرێکی لەروبەرووەوە بۆ سوتاندنی من داگیرساند و ئاگرێکی بۆ سوتاندنی من لەداهاتوودا پاشەکەوت کرد. کەسێك کە بۆهەردوو رۆژی خۆی دەگریت، وەك ئەو کەسە نییە کەبۆ رۆژێك لەداهاتوودا دەگریت. تۆلّەستێن لەتۆلّە سەندنەوەی خوێنی خۆی دلّی ئارام دەبێتەوە بەلاّم دریغ لەم روداوە، ئەگەر تۆلّە بستێنم، جەرگبڕاوم جارێکیتر جەرگ بڕاو کردووە. خۆزگە ئەم خوێنە تەنیا لەناو دەمار و رەگەکانی مندا بووایە کە لەچاوەکانم دەریان دەهێنا. من کوژەرم و کوژراویش. ئەگەری هەیە خوا لەم ژیانە ئاسودەم بکات.

بەلاّم موهەلهیل، ناوی عودەی و بەوتەی هەندێ کەس ئەمرۆ ئەلقەیس بوو. ئەو خالّی ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی حوجری کێندی بوو. بەموهەلهیل بانگیان کرد چوونکە یەکەم کەس بوو قسەی هۆنییەوە و سامانی بەهۆنراوەکان دا. یەکەم کەس بوو لەوتاردان‌دا درۆی کرد. لەمەستی بەهۆش نەهاتوو، گوێی لەدەنگی ژنان بوو کەدەیانقیژاند: کولەیب کوژرا. ئەو ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە و یەکەم کەس بوو سەبارەت بەم روداوە هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| كنا نغار على العواتق ان ترى | بالامس خارجة عن الاوطان |
| فخرجن حين ثوى كليب حسرا | مستيقنات بعده بهوان |
| فترى الكواعب كالظبأ | اذحان مصرعه من الاكفان |
| يخمشن من ادم الوجوه حواسرا | من بعده و يعدن بالازمان |
| متسلبات نكدهن و قدروى | اجوافهن بخرقة و روانى |
| و يقلن من للمستضيف اذا دعا | ام من لخضب عوالى المران |
| ام لا تسار بالجزور اذا غدا | ربح يقطع معقد الاشطان |
| ام من لاسباق الديات و جمعها | و لفادحات نوائب الحدثان |
| كان الذخية للزمان فقداتى | فقدانه و اخل ركن مكان |
| يا لهف نفسى من زمان فاجع | القى على بكلكل و جران |
| بمصيبة لا تستقال جليلة | غلبت عزأ القوم و النسوان |
| هدت حصونا كن قبل ملاوذا | لذوى الكهول معاء للشبان |
| اضحت و اضحى سورها من بعده | متهدم الاركان و الابنيان |
| فابكين سيد قومه و اندبنه | شدت عليه قاطى الاكفان |
| وابكين للا يتام لما اقحطوا | وابكين عند تخاذل الجيران |
| وابكين مصرع جيده متزملا | بدمائه فلذاك ما ابكانى |
| فلا تر كن به قبائل تغلب | قتلى بكل قرارة و مكان |
| قتلى تعاور ها النسور اكفها | ينهشنها و حواجل الغربان |

واتاکەی: دوێنی رژدیمان بەکچە جوانە تازە پێگەشتووەکان دەبرد و تورە دەبووین نەکا لەماڵەکانی خۆیان بێنەدەر و ئازاریان بەرکەوێت. کاتێك کولەیب بەخاك سپێردرا، ئەوان قژ پەرێشان وسەر روت رۆشتنەدەر و گومانیان نەبوو دوای ئەو بەریسوایی دەژین. ئەمرۆ کچە مەمك قوتەکان دەبینی کە لەبەر ئەوەی کولەیب لەناو جل و بەرگی مەرگ لەناو گۆڕدا خەوتووە، هاوشێوەی ناسکەکان سەر و ملیان لەهەر جۆرە خشڵێك بێ بەشە. دوای ئەو روخسارەکانیان لەگەرمی، گەنم رەنگ دەبێت و بە نینۆکەکان دەروشێت و رۆژگارەکان دێت و هیوای باش بوونەوە بەخۆیان دەدەن و دەستیان ناکەوێت. نیازەکانیان تاڵان کراوە. مەرگی ئەو ناخی

ئەوانی بەشتێکی تواوە تێراو کرد و ناخی منیش. کچەکان دەڵێن: کوا ئەو کەسەی کە کەسانی پەنا هێنەر و میوان  و برسی بێدرەنگ دەگرتەخۆ؟ کوا ئەو کەسەی سەری ڕمەکانی لەخوێنی دوژمنان شادان دەکرد؟ یا ئەو کەسەی وەك گێژەڵوکەیەکی توند هەڵیدەکرد و تەنافەکانی لەت لەت دەکرد و وشتر و مەڕی دەلەوەڕاند و ئاگری هەڵدەئایساند. ئەو کوا؟ ئەوەی خوێنباییەکانی لەپێش کەسانیترەوە دەدا یا ئامادەی دەکرد. ئەوەی پەناگەی خەڵکان لەبەردەم رواداوە جەرگ بڕەکان بوو. ئەو کوا؟ ئەو پاشەکەوتی رۆژگار بوو. هەنوکە کاتی ونبوونی ئەو گەشتووە و هەر راوەستاوێکی لەناو بردووە. هاوار لەگیانی من لەرۆژگارێکی مەترسیدار و زیان گەیێنەر کەهەموو قورسایی و باری گرانی خۆی دەخاتە سەرشانی من. رۆژگار پرسەیەکی گرانی بەسەر مندا سەپاند کە لەپرسەی ژنان و پیاوان قورستر بوو. ئەم پرسە، ئەو بورجانە بۆ یەك کەوتەکان و گەنجەکان پەناگا بوون، لەناغەوە دارِماند. دوای ئەو بوورجەکان لەستونەوە رووخان و بناغەیان نەما. هەنوکە ئێوە ئەی کچان و ژنان، بۆ ئەو کەسەی گەورە و سەروەری خەڵکەکەی خۆی بوو و هەنوکە لەجل و بەرگی مەرگدا ئالاوە و کفن کراوە، قورِقورِ بگرین. بۆ منالە بێ باوکەکان بگرین کە بێ سەرپەرەست بوون. بۆ ئەوە بگرین کەئیتر لەمەدوا هاوسێکان دەست لەهاوکاری کردنی ئێوە هەڵدەگرن. لەسەر ملی براوی ئەو بگرین کەدەبینن ئێستا لەخوێنی خۆیدا تلاودتەوە. ئەو گەردنە جوانە، گەردنبەندێکی خوێنینی هەیە. ئەمەیە ئەوەی دەمگریێنێت و دەمسوتێنێت. لەمە دوا لەهەر گۆلاوێك و لەهەر شوێنێك، پیاوانی هۆزی تەغلەب دەکوژم و لەکوژراوی ئەوان تەپۆلکە دروست دەکەم. ئەو کوژراوانەی لاشخۆرەکان بەسەر سەریانەوە هەڵفڕن و گۆشتی ئەوان بپچڕن و قەلە رشەکان بەدەم هەڵبەز و دابەزەوە خۆیان لەگۆشتی ئەوان تێر بکەن.

ئەوسا موهەلهیل رۆشتە ئەو شوێنەی براکەی کولەیب لێی کوژرابوو. خوێنی ئەوی بینی. دواتر ڕۆشتە سەر ئارامگاکەی و ئەم شیعرەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| ان تحت التراب حزما و عزما | و خصيما الد ذا معلاق |
| حية فى الوجار اربد لاين | فعمنه السليم نفث الراقى |

واتاکەی: لەژێر خاك ئەندێشەیەکی راست و مەبەستێکی پایەدار نوستووە.

شەڕکەرێکی چارەسەرنەکراو کەگەردنبەندێکی بەملەوە هەڵواسراوە. لەم چاڵەدا مارێك نوستووە کە لەبەرابەر گەستنەکانی ئەو هەناسەکانی جادوگەر کاریگەر نییە.

ئەوسا ئەو مووی خۆی بڕی و جلەکانی کورت کردەوە و لەژنان و خۆشەویستی ئەوان خۆی دور خستەوە و بردن و دۆڕاندن و بادە خواردنەوەی پشت گوێ خست و خەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە و پیاوانێکی لەوان بۆ لای منالەکانی شەیبان نارد کەڕۆشتنە لای مورە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان. ئەو لەشوێنەکەی خۆیدابوو، پێیان وت: بەکوژرانی کولەیب لەسەر یەك وشتر، کارێکی دژوارتان کرد و ناڵقەی خزمایەتیتان پچراند. ئێمە یەك لەم چوار کارە بەئێوە پێشنیار دەکەین کەبۆ ئێوە هۆکاری رزگاربوونەوە و بۆ ئێمە هۆکاری رەزامەندی و چاوپۆشین. یا کولەیب زیندوو بکەنەوە یا کوژەرەکەی بەئێمە بسپێرن کە لەبەرابەر خوێنی ئەو بیکوژین، یا هەمام بدەنە ئێمە کەهاوتای ئەوە یا ئێمە بەسەر خۆتا ( خۆت ئەی مورە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان) زاڵ بکە چوونکە ئێوە بەسەندەن بۆ خوێنی ئەو.

مورە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبانی وەڵامی دانەوە: بەڵام زیندوو کردنەوە کولەیب، ناتوانم. بەڵام ئەوەی جەساس بەئێوە بسپێرم، ئەو کۆڕێکی لەخۆبایی بوو بەهۆی کەم ئەزمونییەوە گورزێکی وەشاند و سوار ئەسپەکەی خۆی بوو ونازانم رووی لەکوێ کردووە. بەڵام هەمام باوکی عەشیرەیەك، برای عەشیرەیەکی گەورە و مامی عەشیرەیەکە. ئەمانە هەموویان سواران و شەڕکەرانی خەڵکانی خۆیانن و بەگوناحی یەکیتر بەئێوەی ناسپێرن. بەڵام من، هەر ئەوەندە ماوە شەڕ دەسپێ بکات و ئەسپێك بەغاردان بێت و من یەکەم کوژراو بم. بۆ بەرەو مەرگ ڕابکەم؟ (بەرەو مەرگ ڕانەکەم). من دوو پێشنیار بەئێوە دەکەم: ئێستا کوڕەکانی من، هەر کامیان دەخوازن بیگرن و لەجیاتی کولەیب بیکوژن. هەروەها دەتوانم هەزار وشتری چاو ڕەشی سور موتان وەك خوێنبایی پێ بدەم.

خەڵکانی کولەیب تورە بوون و وتیان: تۆ بە بەخشینی ئەمانە سوکایەتیت بەئێمە کرد و خراپەمان لەگەڵ دەکەیت. ئایا ئەتەوێت بەخوێنی کولەیب شیرمان پێ بدەیت؟ ئایا دەتەوێت بەپێش کەش کردنی وشترەکان، خوێنی کولەیب دەرخواردی ئێمە بدەیت؟ ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند. جەلیلە ژنی کولەیب ڕۆشتە

ماڵی باوك و پەیوەستی خەڵکەکەی خۆی بوو. هۆزەکانی بەکر لەشەڕ خۆیان بەدوور گرت و کوژرانی کولەیبیان بەگەورە و هاوکاری کردنی مناڵەکانی شەیبانیان بەناسازگار بینی. لوجەیم و یەشکور خۆیان بەدوور گرت و حارس کوڕی عوباد دەستی لەهاوکاری کردنی ئەوان هەڵگرت و خەڵکەکەی هاوڕێ لەگەڵ ئەو دەستیان لەشەڕ هەڵگرت. موهەلهیل چەندین شێعری بۆ مەرگی براکەی هۆنییەوە، یەکیان بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| كليب لا خير فى الدنيا و من فيها | اذا انت خليتها فيمن يخليها |
| كليب اى فتى عز و مكرمة | تحت السقائف اذ يعلوك سافيها |
| نعى النعاة كليبا لة فقلت لهم | مالت بنا الارض نو زالت رواسيها |
| الحزم و العزم كانا من صنيعته | ماكل الانه يا قوم احصيا |
| القائد الخيل تردى فى اعنتها | رهوا اذا الخيل لجت فة تعاديها |
| من خيل تغلب ما تلقى اعنتها | الا و قد خضبووها من اعاجيها |
| يهزهزون من الحطى مد مجة | صما انا بيبها رزقا عواليها |
| ليت السماء علة من تحتها وقعت | و انشقت الارض فا نجابت بمن فيها |
| لا اصلح اللة منا من يصالحكم | مالاحت الشمس فة اعلى مجاريها |

واتاکەی: ئەی کولەیب کاتێك تۆ هاوڕێ لەگەڵ مردووان لەم دنیایە تێپەڕی، ئەم دنیایە هیچ چاکی و باشییەکەی تیا نییە. ئەی کولەیب، چەندە پیاوێکی بەرێز و هێژا بوویت. ئەو ڕۆژانە وەك چەپکە گوڵێك لەژێر بانی ماڵەکان کۆڕ خۆشکەری شاسوارەکانی خەڵکەکەی خۆت بوویت و هەنوکە خۆڵی گۆڕیان بەسەر پەیکەرە نازەنینەکەتا پرژاندووە. هەواڵنێران هەواڵی مەرگی ئەویان هێنا و بەوانم وت: ئێستا زەوییە ئێمە دەلەرێنێتەوە یا کێوە بەهێز و سەنگینەکان کە لەسەر زەوی هەڵیان گرتووە. ئەندێشەی ڕاست و مەبەستی بەهێز لەعادەتە باشەکانی ئەو بوون. ئەی خەڵکینە، ناتوانم هەموو چاکییەکانی ئەو باس بکەم. سوارکارە تیژ پێکان و بلەزەکان کە هەوساریان بەرەڵا دەبوو بەغاردان و نەرمی دەڕۆشتن و ئەسپەکانیتر غاریان دەدا تا خۆیان بەو بگەیێنن. لەناو سوارکارەانی تەغلەب کەڕمەکانیان

داناگرن مەگەر ئەوەی لەخوێنی دوژمنان تێراویان کردبێت. ڕمە دروست کراوەکانی ختیان رادەوەشاند. خۆزگە ئاسمان لەسەرەوە دەکەوتە خوار و خەڵکانی دادەپۆشی. خۆزگە زەوی قەڵشتی دەبرد و خەڵکانی قوت دەدا. هیچ کام لەئێمە کە بیەوێت لەگەڵ ئێوەدا ئاشتی بکات، خوا نەیبەخشێت. ئەم سوێندە هەمیشەیی بێت. پایەدار بێت بەوشێوەی خۆر لەشوێنی سوڕانەوەی بەرزی خۆی لەسوڕاندایە.

یەکەم شەڕ لەڕۆژی عەنیزە لەشوێنێك بەناوی (فەلجە) لەنێوان ئەوان رویدا. هەردووك یەکسان بوون. موهەلهیل وتی:

**كانا غدوة و بنى ابينا بجنب عنيزة رحيا مدير**

**ولولا الريح اسمع اهل حجر صليل البيض تقرع بالذكور**

واتاکەی: دەڵێی ئێمەلەگەڵ کوڕانی باوکمان دەجەنگین و لەلای عەنیزە لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەین، دوبەرداشی سوڕاوین. ئەگەر بایی گۆڕەپانی شەڕنەدەبوو، کەسانی حۆجر دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکانیان دەبیسرا کەبەسەر پیاوا نازاکان دەهاتە خوار.

ئەوان بلاوەیان لێکرد و رۆژگارێکیان بەمشێوەیە بەسەر برد. ئەوکات لەسەر ئاوێك بەناوی (نهی) چاویان بەیەك کەوت. منداڵەکانی شەیبان لەسەر ئاوەکە بوون. دەستەیەك دەڵێن ئەمە یەکەم شەڕ لەنێوان ئەواندا بوو. سەرۆکی تەغلەبییەکان موهەلهیل بوو و سەرکردەی شەیبانیان حارس کوڕی مورە. شەڕ لەزیانی منداڵەکانی تەغلەب درێژی کێشا و سەرکەوتن و هێز لەدەستی منداڵەکانی شەیبان بوو. شەڕ لەناو ئەواندا قورس بەلام لەم رۆژەدا کەس لەمنداڵەکانی مورە نەکوژرا.

دواتر لەشوێنێك بەناوی (زەنایب) رووبەرووی یەکبوونەوە. ئەمە قورسترین شەڕێك بوو لەنێوان ئەواندا رویدا. منداڵەکانی تەغلەب لەسەرکەوتن نزیك بوونەوەو ژمارەیەکی زۆرلەبەکرییەکانیان کوشت. لەم رۆژەدا ئەمانە کوژران: شەراحیل کوڕی مورە کوڕی هەمام کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان باوەگەورێی حەوفەزان و باوەگەڕێی مەعن کوڕی زایدە، حارس کوڕی مورە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان (لەمنداڵەکانی زوهەل کوڕی سەعلەبە) عەمرۆ کوڕی سەدوس کوڕی شەیبان کوڕی زوهەل و

کەسانیتر لەگەورەکانی بەکر.

دواتر لەرۆژی واردات چاویان بەیەك کەوت و شەڕێکی قورسیان هەڵایساند کەدووبارە تەغلەبیەکان سەرکەوتن. کوژراوەکانی بەکر زیادی کرد. لەم رۆژەدا هەمام کوڕی مورە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان برای باوك و دایکی جەساس کوژرا. موهەلهیل لایەوە تێپەڕی و کاتێك ئەوی بینی وتی: سوێند بەخوا دوای کولەیب هیچ کوژراوێك بەرێزتر لەتۆ نەبوو. بەخوا سوێند بەکرییەکان دوای ئێوە دووانە، خێر نابینن. دەستەیەك دەڵێن: هەمام لەرۆژی قوسەیبات پێش لەرۆژی قیزە کوژرا. پیاوێك بەناوی ناشرە ئەوی کوشت کەهەمام ئەوی هەڵگرتبوویەوە و پەروەردەی کردبوو و ناوی نابوو ناشرە. ئەو لای هەمام دەژیا، کاتێك گەورە بوو، زانی تەغلەبیە. کاتێك ئەم شەڕە دەستیپێکرد، هەمام بەردەوام شەڕی دەکرد و کاتێك تینوی دەبوو، دەهات و ئاوی دەخواردەوە. ناشرە جارێکیان ئەوی بێ ئاگا بینی و لەناکاو کوشتی و بەرەو خەڵکی تەغلەب رایکرد. نزیك بوو جەساس بکوژرێت بەڵام تەندروست رزگاری بوو. موهەلهیل وتی:

لو ان خیلی ادرکتك وجدتهم مثل اللیوث بستر غب عرین

هەروەها لەم هۆنراوەدا دەڵێت:

ولا وردن الحیل بطن اراکة ولا قضین بفعل ذاك دیونی

ولا قتلن جحا جحا من بکرکم ولا بکین بها جفون عیون

حتی تظل الحاملات مخافة من وقعنا یقذفن کل جنین

واتاکەی: ئەگەر سوارەکانی من رووبەرووی تۆ دەبوونەوە ئەوانت هاوشێوەی شێرەکانی ژیان دەبینی کەدور لەدەستن و لەهێلانەکانی خۆیان جێگەیان گرتووە. سوێند بەخوا ئەسپەکانی خۆم دەبەمە (ئەراکە) و بەم شێوە قەرزەکانی خۆم وەردەگرمەوە. بێ گومان لەناو باشترینەکانی ئێوە خەڵکانێك کوشتار ئەکەم و لەم رێگادا فرمێسك لەهەندێ چاو دەبارێنم (چاوەکانی ئێوە گریاناوی دەکەم). کارێك دەکەم ژنانی سکپڕ بەردەوام ترسی ئێمەیان لەدڵدا بێت و مناڵەکانیان ببێت.

سەبارەت بەچۆنیەتی ئەم شەڕانە ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە کە بەخواستی خوای گەورە ئاماژەیان پێ دەدەین.

باوکی نویرەی تەغلەبی و هاوشێوەکانی پێشرەوەکانی خەڵکانی خۆیان و جەساس پێشڕەوی خەڵکانی خۆی بوو. شەوێك جەساس و باوکی نویرە چاویان بەیەك کەوت. باوکی نەویرە پێی وت: یەك لەم چەند کارە هەڵبژێرە: زۆران بازی، ڕم وەشاندن یا شمشێری وەشاندن. جەساس زۆرانی هەڵبژارد. ئەو دووانە باوەشیان بەیەکدا کرد. خەڵکی ئەوان گومانیان دەکرد دواکەوتوون. بەدوایاندا گەڕان و بینیان کەپێکەوە زۆران دەگرن. نزیك بوو جەساس لەزەوی بدات. ئەم دووانەیان جیا کردەوە.

لەمەدوا تەغلەبیەکان زیاتر لەجاران بەدوای جەساسدا دەگەڕان. باوکی مورە پێی وت: برۆ لای خاڵۆکانی خۆت لەشام و لەوێ پەنا بگرە. ئەو ڕازی نەبوو. باوکی پێداگری کرد و ئەوی لەگەڵ پێنج کەسدا نارد. ئەم هەواڵە بەموهەلهیل گەشت و باوکی نەویرەی لەگەڵ سی کەس لەهاوەڵە ئازاکانی خۆی ڕەوانە کرد. بەپەلە ڕۆشتن و جەساسیان دۆزییەوە. جەساس ڕوبەڕویان وەستایەوە و باوکی نەویرە لەگەڵ هاوەڵەکانی کوژران و لەمان جگە لەدووانیان ڕزگاری نەبوو. جەساس بەسەختی بریندار و بەهۆی کاریگەری ئەم برینەوە مرد. هاورێکانی کوژران و جگە لەدووانیان کەسیان ڕزگاری نەبوو. هەرکام لەرزگاربووان گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان.

کاتێك مورە هەواڵی کوژرانی کوڕەکەی، جەساسی بیست، وتی: خەمبارم کە ئەو کەسی لەوان نەکوشت. پێیان وت: بەدەستی خۆی سەرکردەی ئەوان باوکی نەویرەی کوشت و هاورێ لەگەڵ ئەو پانزە کەسی بەدەستی خۆی کوشت کەلەم کارەدا هاریکاری نەبوو. ئێمە ئەوانیترمان کوشت. مورە وتی: ئەمە ئەو شتەیە دڵم بەجەساس خۆش دەکات.

دەستەیەك دەڵێن: جەساس دوایین کەس بوو لەشەڕی بەکر و تەغلەب کوژرا. هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو کەخوشکەکەی جەلیلە ژنی کولەیب کوڕی وایل بوو. کاتێك کولەیب کوژرا ئەو دووگیان گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی و لەم ناوەدا شەڕ دەستی پێکرد و هەردوولای شەڕکەر دوژمنایەتیان لەگەڵ یەکتر کرد. دوای

ئەوە رێکەوتن. پێشتر بۆ لەناوبردنی یەکتر هەوڵیان دەدا. خوشکەکەی جەساس کوڕێکی هێنایە دنیا و ناوی نا هێجرێس. جەساس پەروەردەی و گەورەی کرد و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری. کوڕ جگە لەو کەسی بەباوك نەدەزانی. رۆژێك لەنێوان هێجرێس و یەکێك لەبەکرییەکان دەمەبۆڵەیەك رویدا و بەکری پێی وت: تۆ دەست لەخراپە هەڵناگریت تا ئەو کاتەی ئەتنێرینە لای باوکت. هێجرێس دەستی لێ بەردا و خەمبار گەڕایەوە بۆ لای دایکی و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. کاتێك لای ژنەکەی خەوت، ژن پەرێشانی و شڵەژانی پێوە دی. ژن ئەمەی بەباوکی یانی جەساس وت. جەساس وتی: سوێند بەخوای کەعبە خوێنی دەوێت! ئەو بەنیگەرانی و پەریشانی شەوی کردە رۆژ. ئەوسا زڕکوڕەکەی خۆی هێجرێسی بانگ کرد و وتی: تۆ کوڕی منیت و لای من ئەو پێگەت هەیە کەخۆت دەیزانی. من کچەکەم کردە هاوسەری تۆ. شەڕ لەگەڵ باوکی تۆ دەگرێتەوە بۆ چەندین ساڵ پێش و ئێمە ئێستا ئاشت بووینەوە و دەستمان لەیەك هەڵگرتووە. پێم خۆشە تۆیش لەسەر ئاشتی بمێنیتەوە و وەك خەڵکان هەڵس کەوت بکەیت. لەگەڵ من بێیت تاهاوشێوەی کەسانیتر پەیمانت لێ وەربگرین. هێجرێس وتی: ئەم کارە دەکەین. جەساس ئەوی سوار ئەسپ کرد. ئەو سوار بوو و کەرەستەی شەڕ و تیر و کەوانی هەڵگرت و وتی: کەسێکی وەك من بێ کەل و پەلی شەڕ ناڕواتە لای کەسەکانی خۆی. ئەو دووانە هاتن تا گەشتنە دەستەیەك لەخەڵکەکەی خۆیان. جەساس داستانەکەی باس کرد و ئاگاداری کردنەوە کەهێجرێس ئەو بەڵێنەی خەڵکەکەی داویانە، دەیدات و ئەو کارە دەکات کە ئێوە کردتان. کاتێك دەفری خوێن( وەك تەشت و هاوشێوەکانی کەبۆ پەیمان بەستن دەستیان تێ دەکرد) هێنایان و رویان کردە شوێنی پەیمان بەستن، هێجرێس ڕمەکەی خۆی گرت و وتی: سوێند بەئەسپەکەم و دو گوێچکەم و ڕمەکەم و دو تیرەکەی و شمشێرەکەم و دو لێوارەکەی کەپیاو، واز لە کوژەری باوکی ناهێنێت. جەساس سەیری دەکرد ( یا ئەو سەیری جەساسی دەکرد). دواتر گورزێکی لەجەساس دا و کوشتی و هەلآن و گەڕایەوە بۆ ناوخەڵکەکەی. ئەو دوایین کوژراوی بەکر بوو. گێڕانەوەی یەکەم راست ترە.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر داستانەکە.

کاتێك جەساس کوژرا، باوکی مورە پەیامی بۆ موهەلهیل نارد و پەیامی دا: تۆ خوێنی خۆتت گرت و جەساست کوشت. ئێستا دەست لەشەڕ هەڵبگرە و واز لەسەرسەختی وخوێن ڕشتن بێنە و پەیمانی ئاشتی ببەستە کەبۆ هەردوو هۆزەکە باشتر و بۆ دژومنان خراپترە. ئەو بەم داوایە رازی نەبوو. حارس کوڕی عیباد پشتی کردبووە شەڕ و نەهاتبووە گۆڕەپانی شەڕ. کاتێك جەساس و هەمام کوڕەکانی مورە کوژران. ئەو کوڕەکەی خۆی بوجەیر، هەمان کوڕی عەمرۆ کوڕی عیباد برای حارس کوڕی عیبادی لەسەر وشترێك نارد و هاورێ لەگەڵ ئەو بۆ موهەلهیلی نوسی: تۆ لە کوشتار زێدەڕۆییت کرد و زیاد لەوەی چەندین کەست لەبەکرییەکان کوشت، تۆڵەی خۆیشت سەندەوە. هەنوکە من کوڕەکەم بۆ لای تۆ دەنێرم. یا بیکوژە و لەنێوان ئەم دوو هۆزە ئاشتی سەقامگیر بکە یا ئازادی کە و ئاگری کینە بەناوی ئاشتی دامرکێنەرەوە. لەم شەڕانەدا کەسانێك لەناوچوون کەمانەوەیان بۆ ئێمە و ئێوە باشتر بوو. کاتێك لەنامەکە ئاگادار بوویەوە بوجەیری گرت و کوشتی و وتی: بەقەیتانی پێلاوەکانی کولەیب بگەرێرەوە! کاتێك باوك ئەم هەواڵەی بیست، گومانی برد کەئەوەی لەجیاتی براکەی کوشتووە تا لەنێوان ئەو دوو هۆزەدا ئاشتی سەقامگیر بکات. لەبەر ئەمە وتی: چ کوژراوێکی باش بوویت کە ئاشتیت لەنێوان دو کوڕەکەی وایلدا سەقامگیر کرد. پێی وترا کەموهەلهیل وتویەتی: بە قەیتانی پێلاوەکانی کولەیب بگەرێرەوە. لەم کاتەدا حارس کوڕی عیباد توڕە بوو وتی:

| | |
|---|---|
| قربا مربط النعامة منی | لقحت حرب وائل عن حیال |
| قربا مربط النعامة منی | شاب رأسی و انکرتنی رجالی |
| لم اکن من جناتها علم اللة | و انی بحرها الیوم صالی |

واتاکەی:

شوێنی بەستنەوەی ئەسپەکەم (نعامە) لەمن نزیك بکەنەوە کەشەڕی وایل یەخەی گرتوین و ئەبێت خۆمانی بۆ ئامادە بکەین. شوێنی بەستنی نەعامە لەمن نزیك بکەنەوە کەسەرم سپی بوو و هاورێکانم لەبیریان کردم تا ئەو جێگەی

نەیناسیمەوە. خوا ئەزانێت من لەتاوانبارانی ئەم شەڕە و هەڵگیرسێنەرانی نەبووم بەڵام ئەمڕۆ لەئاگرەکەیدا دەسوتێم.

ئەسپەکەی یانی نەعامەیان هێنا. لەو ڕۆژگارەدا هاوتای نەبوو. سواری بوو و فەرماندەیی بەکرییەکانی گرتە دەست و لەشەڕدا ئامادە بوو. یەکەم ڕۆژ کەئەو تیایدا ئامادە بوو ڕۆژی قێزە بوو کەپێیان دەوت ڕۆژی (سەر تاشراوەکان).بۆیە ئەو ناوەیان لێنا چوونکە بەکرییەکان سەری خۆیان تاشی بۆ ئەوەی یەکتر بناسنەوە. تەنیا باوکی مەسامیعە جەحدەر کوڕی زوبەیعە کوڕی قەیس ئەم کارەی نەکرد و وتی: من کورتم، ناشیرینم مەکەن. قژەکانم لەئێوە بەیەکەم سوار کە لەدوژمن بێتە پێش دەکڕمەوە. لەم کاتەدا عەناق دەرکەوت و هاتە پێش. جەحدەر کوڕی زوبەیعە هێرشی کردە سەر و ئەوی کوشت. ئەو لەو ڕۆژەدا دەیخوێند و دەیوت:

**ردوا على الخيل ان المت ان لم اقاتلهم فجزوا المتى**

واتاکەی: ئەگەر ئەسپەکان ڕۆشتنە ڕاو، بەمن بیانگەڕێیننەوە. و ئەگەر شەڕم لەگەڵدا نەکردن، سەرم بتاشن.

لەم ڕۆژەدا حارس کوڕی عیباد ئازایانە شەڕی کرد و لەناو تەغلەبیەکان کوشتارێکی سەخت و گیانبڕی بەرێخست.

لەم ڕۆژەدا خارس کوڕی عیباد موهەلهیل کەهەمان عودەی بێت، ئەسیری کرد بەڵام ئەوی نەدەناسی. حارس پێی وت: موهەلهیلم نیشان بدە تا ئازادت بکەم. عودەی وتی: ئایا بەڵێنی خوایی ئەدەیت کە ئەگەر ئەو بەتۆ نیشان بدەم ئازادم بکەیت؟ حارس وتی: بەڵێ. موهەلهیل وتی: خۆمم. حارس قژی ناوچاوانی بڕی و ئازادی کرد و لەمبارەوەوتی:

**لهف نفسى على عدى و لم اع رف عديا اذ امكنتنى اليدان**

واتاکەی: هاوار لەگیانی بەئازاری من کەکاتێك دەستم بە عودەی گەشت نەمناسیەوە.

ئەو ڕۆژانەی شەڕ لەنێوان ئەم دوو دەستە گەرم بوو، پێنج ڕۆژ بوون: ڕۆژی یەکەمی عونەیزە کەهەر دوولای شەڕ بەرابەر بوون، ڕۆژی دووەم واردات کە لەبەرژەوەندی تەغلەب و زیانی بەکر کۆتایی هات، ڕۆژی سێیەم کە لەبەرژەوەندی بەکر و زیانی تەغلەب بوو، ڕۆژی چوارەم قوسەیبات کەبەکرییەکان شکستێکی قورسیان خوارد تا ئەو رادەی گومانیان دەکرد رزگاریان نابێت، ڕۆژی پێنجەم یا ڕۆژی سەرتاشراوەکان کەحارس کوڕی عیباد تیایدا ئامادە بوو. دوای ئەم شەڕانە شەڕی بچوکتریش رویاندا. لەوانە: ڕۆژی نەقیە و ڕۆژی فەسڵ لەبەرژەوەندی بەکر لەبەرابەر تەغلەب. دوای ئەوە لەشکرکێشی ئەنجام نەدرا بەڵکو شێوەی پەلاماردانی بەخۆوە گرت. شەڕی نێوانیان چوار ساڵی خایاند.

دواتر موهەلهیل بەخەڵکەکەی وت: باوەڕم وایە خەڵکی خۆتان بەزیندویی بهێڵنەوە چوونکە ئەوانە باشەی نێوەیان دەوێت. لەسەرەتای شەڕەوە تا ئێستا چوار ساڵ تێپەڕیوە بەڵام سەرزەنشتان ناکەم چوونکە داوای خوێنی خۆتان دەکرد. ئەگەر ئەم ساڵە درێژانە بەنارامی و ئاسودەی تێدەپەڕین، لەدرێژی خۆیان خەڵکیان بێزار دەکرد چ بگات بەوەی لەدرێژی ئەم ساڵانەدا دوو هۆز لەناو چوون و مناڵەکان بێ باوك. شینێکە پایەدار، ناڵەیەکە لەهەر سوچ و قوژبنێك بڵند، فرمێسکێکە دەبارێت و وشك نابێت، جەستەیەکە لەسەر زەوی ماوەتەوە، شمشێرێکە لەکالان دەرکێشراوە و ڕمێکە بەرز کراوەتەوە. بەیانی ئەم خەڵکە بەهاورێیەتی پەیوەندی خزمایەتی بۆ لای ئێوە دەگەرێنەوە و خزمەکان بۆ یەك میهرەبان دەبن بەشێوەیەك تەنانەت لەقەیتانی پێڵاوەکانیش لەسەر بنەمای بەرابەری لەگەڵ یەك هەڵس وکەوت دەکەن.

دواتر موهەلهیل وتی: گیانی من بەوە شاد نییە لەناو ئێوەدا بمێنمەوە و کوژەری براکەی خۆم ببینم و سەیری بکوژی کولەیب بکەم. لەوە دەترسم ئێوە ناچار بە لەناوبردنی ئەوان و خۆتان بکەم. بەرەو یەمەن دەڕۆم. ئەو ڕۆشتە یەمەن و لەناو (جەنب) کەلقێك لەهۆزی مەزجیحە نیشتەجێ بوو. ئەوان هاتنە خوازبێنی کچەکەی بەڵام نەیدا. بۆ ئەو کارە ناچاریان کرد و مارەیی ئەویان لەپێستی چەرمین هێنایە پێش. ئەو لەمبارەوە هۆنییەوە:

اعزز علی تغلب بما لقیت — اخت بنی الاکرمین من جشم
انکحها فقدها الاراقم فی — جنب و کان الحباء من ادم
لو با بانین جاء یخطبها — ضرج ما انف خاطب بدم

واتاکەی: دژوار بێت لەسەر تەغلەبیەکان ئەوەی خوشکی منداڵەکانی بەرێز لەجەشم گرفتاری بوو. نەبوونی ئەراقم ئەوەی ناچار بەمێرد کردن لەجەنب کرد و مارەییەکەی لەناو پێست هێنرا. ئەگەر بێن ونەو بەهاوسەنگی دوو کێوی ئەبان بەزێر خوازبێنی بکەن، لوتی خوازبێنیکەر لەخاك و خوێن دەدرێت.

ئەراقم هۆزێك لەجەشم کوڕی تەغلەب بوون. یانی داخەکەم ئەراقم نین کەخەڵکانی خانەدان لەوان بوون. لەبەر ئەمە پیاوێك ئەوەی کردە ژنی خۆی و مارەییەکەی بەپێست دا.

دواتر موهەلهیل بۆ سەرزەمینی خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە و عەمرۆ کوڕی مالیك کوڕی زوبەیعە بەکری لەپانتاییەکانی هیجر ئەسیری کرد بەڵام ڕێزدارانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرد. لەم کاتەدا بازرگانێکی بادە فرۆش کەبادەکانی خۆی لەهیجرەوە هێنابوو، هات. ئەو هاوڕێی موهەلهیل بوو. لەهەمان کاتی گرفتاری، بازرگان بادەی پێش کەش کرد. کوڕانی مالیك لەدەوری کۆبوونەوە و وشترێکی گەنجیان کوشت و لای موهەلهیل لەو ماڵەی عەمرۆ بۆی جیا کردبوویەوە، بادەیان خوارد. کاتێك لەبادە سەرخۆش بوون، موهەلهیل دەستی بەخوێندن کرد و ئەوەی لەپرسەی براکەی کولەیب وتبووی، هێنایە سەرزمان و بۆ کولەیب گریا. عەمرۆ ئاوازەکەی بیست و وتی: ئەو تێراوە، سوێند بەخوا لای من ئاو ناخواتەوە تا (زەبیب) بگات. زەبیب وشترێکی نێری گرانبایی بوو کەبۆ هێنانی ئاو ڕۆشتبووە شوێنێکی دوور و دوای پێنج ڕۆژ، ئەویش لەگەرمای سوتێنەری هاوین دەگەڕایەوە. منداڵەکانی مالیك بەدوای زەبیبدا گەڕان و پێداگریان کرد بۆ ئەوەی موهەلهیل لەناونەچێت بەڵام نەیانتوانی بیدۆزنەوە و موهەلهێل لەتینویەتیدا مرد.

دەستەیەك دەڵێن: کچە پوری موهەلهیل کەکچی (موجەلەلی تەغلەبی) بوو، ژنی

عەمرۆ بوو. ئەو لەو کاتەی موهەلهیل دیل کرا بوو، هەوڵیدا بڕواتە لای و لەگەڵیا هاوئامێز بێت. موهەلهیل ئەم هۆنراوەی بۆ ئەو دڵدارە هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| طفلة ما ابنة المجلل بيضا | ء لعوب لذيذة فى العناق |
| فاذهبى ما اليك غير بعيد | لا يؤاتى العناق من فى الوثاق |
| ضربت نحرها الى وقالت: | يا عدى لقد وقتك الاواقى |

واتاکەی: کچی موجەلەل دڵدایەکی کەم تەمەن وگەنجە. پێستێکی سپی هەیە. لێزانە و لەکاتی هاوئامێزی چێژێکی خۆش دەبەخشێت. لە من دوورکەوەرە نازەنینم بەڵام نەنەوەندەی دەستم بەتۆ نەگات. ئەوەی لەبەندا بێت ناتوانێت هاوئامێز بێت لەگەڵ ژنان. نازەنینم سینەی لەمن سوو، وتی: ئەی عودەی، کەسانی زۆر تۆیان ڕاگرتووە.

ئەمانە بەیتی زۆر بوون، ئەمەیان بەگوێی عەمرۆ کوڕی مالیك گەیاند. سوێندی خوارد تا زەبیب نەگات ئاو بەموهەلهیل نەدات. خەڵك داوایان لێکرد زەبیب پێش کاتی دیاریکراو بێنێت. ئەوی هێنا و ئاوی دا بەموهەلهیل تا سوێندەکەی خۆی بردبێتە سەر بەڵام لەپیسترین ئاوەکانی ئەوێی دەرخوارد دا و لەئەنجامدا نەخۆش کەوت و مرد.

## شەڕی نێوان حارس ئەعرەج و منداڵەکانی تەغلەب

باوکی عوبەیدە دەڵێت: بەکرییەکان و تەغلەبییەکان لەمنداڵەکانی وایل، دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکەیان ڕۆشتنە لای مونزەر کوڕی ما السماء ، ئەوکەسەی ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر کرد، قەیس کوڕی شەراحیل کوڕی مورە کوڕی هەمام بوو. دواتر مونزەر ئەوانی بۆ شەڕی ئاکیل ئەالمورار نارد و کوڕی عەمرۆ کوڕی هیندی کردە فەرماندەی منداڵەکانی بەکر و منداڵەکانی تەغلەب و وتی: بڕۆ شەڕی خاڵەکانت. ئەو ڕۆشتە شەڕی ئەوان و شەڕێکی قورس ڕویدا کەتیایدا منداڵەکانی ئاکیل المورار شکستیان خوارد و گرفتار بوون. ئەوانیان هێنا بۆ لای مونزەر و ئەوانی کوشتار کرد.

دواتر تەغلەبیەکان لەمونزەر پچڕان و پەیوەستی شام بوون. ئێمە هۆکاری ئەم کارە لەکاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی منداڵەکانی شەیبان ئاماژەی پێدەدەین. شەڕی نێوان ئەوان و بەکرییەکان دوبارە سەری هەڵدایەوە. لەم ناوەدا پاشای غەسان لەشام یانی حارس کوڕی ئەبی شیمری غەسانی لەلای چەندین دەستەی بەربڵاو لەتەغلەبیەکان تێپەڕی کرد کە بەباشی پێشوازیان لێنەکرد. عەمرۆ کوڕی کەلسوم سوار بوو و ڕۆشتە بینینی پاشای غەسان. حارس پاشای غەسان پێی وت: چ هۆکارێك وای لەخەڵکەکەت کرد بەباشی پێشوازی لەمن نەکەن؟ وتی: لە تێپەڕینی تۆ ئاگادار نەبوون. پاشا وتی: ئەگەر بگەڕێمەوە شەڕێکی وایان لەگەڵ دەکەم بۆ هەمیشە بەئاگا بن. عەمرۆ وتی: هەر خەڵکێك بەئاگا بێتەوە، باوەڕیان بڵند و کۆڕەکانیان بەهێز دەبێت، ئەوان لەخەو هەڵمەستێنە. پاشا وتی: ئەبینم کەمن لەوان ئەترسێنیت. سوێند بەخوا ئەگەر لاوە دانا و فرەزانەکانی غەسان ئەسپەکانیان لەنێوان ئێوەدا غار بدەن، بەشێوەیەکی وا خەڵکەکەی تۆ دەخەوێنن کە هیچ کات لەخەو هەڵنەستن. ڕیشەی ئەوان دەردەهێنرێت و پاشماوەکانیان بەرەو ڕێگە دژوارەکان و چاڵە خاڵی کراوەکان لەناو دووردەخرێنەوە و لەناو دەچن. دواتر عەمرۆ کوڕی

کولسوم ڕۆشت و هاتە لای خەڵکەکەی خۆی و وتی:

| | |
|---|---|
| الافا علم ابيت اللعن انا | ابيت اللعن نابى ما تريد |
| تعلم ان محملنا ثقيل | و ان دبار كبتان شديد |
| و انا ليس حى من معد | يقاومنا اذا لبس الحديد |

واتاکەی: ئەی پیاوەی گەورە، لەنفرین بەدور بیت. بزانە و لەنفرین بەدوور بە کەئێمە لەوەی تۆ دەتەوێت خۆ دوور دەخەینەوە. بزانە باری ئێمە گرانە و وێرانی و مەرگی بەدیهاتو لەهێرش کردنە سەر ئێمە سەخت. هیچ هۆزێك لەمەعدییەکان ئەگەر ئاسنیش بپۆشن توانای بەرگەگرتنی ئێمەیان نییە.

کاتێك حارس ئەعرەج گەڕایەوە ڕۆشتە شەڕی منداڵەکانی تەغلەب و هەردوولا شەڕیان کرد و شەڕ قورس بوو. حارس و غەسانییەکان شکستیان خوارد و براکەی حارس لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کوژرا. عەمرۆ کوڕی کولسوم وتی:

| | |
|---|---|
| هلا عطفت علة اخيك اذا دعا | بالثكل ويل ابيك يا ابن ابى شمر |
| فذق الذى جشمت نفسك و اعترف | فيها اخاك و عامر بن ابى حجر |

واتاکەی: هاوار لەباوکت ئەی کوڕی ئەبی شیمر، بۆ، چوونکە براکەت هاواری دڵ سوتانی بەرز کردەوە، بەمیهرەبانی رووت تێنەکرد؟ ئێستا ئەوەی خۆتت گیرۆدە کرد، بیچێژە و ئەم شەڕەدا براکەت و عامیر کوڕی ئەبی حۆجر بناسە و بیانبینە.

## شەڕی عەین ئۆباغ

ئەم شەڕە لەنێوان مونزەر کوڕی ما السما و حارس ئەعرەج کوڕی ئەبی شیمری جەبەلە رویدا. دەستەیەك نەژادنامەی ئەویان بەم شێوە وتووە: باوکی شیمر عەمرۆ کوڕی جەبەلە کوڕی حارس کوڕی حۆجر کوڕی نەعمان کوڕی حارس نەیهەم کوڕی حارس کوڕی ماریەی غەسانی. سەبارەت بەرەچەڵەکەی ئەو ئاماژەیان بەبابەتی دیکەیش داوە. ژمارەیەکی زۆرتر ئاماژەیان بەم رەچەڵەکە داوە و ئەمە راستترە. ئەو بوو باروبنەی ئەمرۆ ئەلقەیس و زرێکانی ئەوی لەسەمئوال کوڕی عادیا داوا کرد و کوڕەکەی ئەوەی لەسەر ئەم کارە کوشت. ئاماژەیان بە شتی دیکەیش داوە و خوا زاناترە.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو مونزەر کوڕی ما السما پاشای عەرەب لەگەڵ هەموو مەعدییەکان لەحیرەوە بەرێکەوت و لەعەین ئۆباغ لەشوێنێك بەناوی زات ئەلخیار دابەزی. بۆ حارس ئەعرەج کوڕی جەبەلە کوڕی حارس کوڕی سەعلەبە کوڕی جەفنە کوڕی عەمرۆ مزەیقیا کوڕی عامیری غەسانی پاشای عەرەب لەشام پەیامی نارد: یا باج بدە یا لەگەڵ لەشکرەکەی خۆم بگەڕێمەوە یا ئامادەی شەڕبە.

حارس پەیامی ناردەوە: دەرفەتمان پێبدە تا راوێژی خۆمان بکەین. ئەو سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و روی لەمونزەر کرد و پەیامی بۆ نارد: من و تۆ دوو پیرە پیاوی بەساڵاچووین. لەشکرەکەمان لەناو نەبەین بەڵکو یەکێك لەکوڕەکانی من و یەکێك لە کوڕەکانی تۆ پێکەوە شەڕ بکەن و هەرکام کوژرا ئەویتر جێگەی بگرێتەوە و ئەگەر منداڵەکانمان کوژران من دێمە شەڕی تۆ و هەرکام کوژراین، پاشایەتی بۆ ئەویتر بێت. مونزەر یەکێك لەپیاوە ئازاکانی سوپاکەی بانگ کرد و فەرمانی پێدا لەنێوان دوو سوپادا راوەستێت و وا نیشان بدات کەکوڕی مونزەرە. کاتێك هاتەدەر حارس کوڕەکەی خۆی ئەبوبەکری بۆ شەڕ نارد. کاتێك کوڕەکە ئەوی بینی، بۆ لای

باوکی گەڕایەوە و وتی: ئەمە کوڕی مونزەر نییە بەڵکو کۆیلە یایەکێك لەپیاوە نازاکانی ئەوە. حارس وتی: ئایا لەمەرگ ترساویت؟ لاو بۆ لای گەڕایەوە و شەڕی لەگەڵ کرد و شەڕکەرەکەی مونزەر کوشتی و سەری بردە لای مونزەر و لەسەر زەوی دانینا و جارێکیتر هاتە ناو گۆڕەپان و داوای شەڕکەری کرد. حارس یەکێتر لەکوڕەکانی بۆ سەندنەوەی تۆڵەی براکەی نارد. ئەو هاتە دەر و کاتێك سەیری کرد، بۆ لای باوکی گەڕایەوە و وتی: باوکە، سوێند بەخوا ئەمە کۆیلەکەی مونزەرە. حارس وتی: پیرەپیاو فێڵ نادۆرێنێت. کوڕ هات و هێرشی کردە سەر و کوژرا.

کاتێك شیمر کوڕی عەمرۆ حەنەفی کەدایکی غەسانی و خۆی لەسوپاکەی مونزەردابوو، ئەمەی بینی، وتی: پاشا، فێڵ و تەڵەکە کاری پاشاکان و گەورەکان نییە. تۆ دووجار فێڵت لەکوڕە مامەکەت کرد. مونزەر تورە بوو. فەرمانی دەرکردنی ئەویان دەرکرد. ئەو پەیوەستی سوپاکەی حارس بوو و هەموو شتێکی باس کرد. حارس وتی: داواکاری خۆت بڵێ. وتی: هاونشینی و دۆستایەتی تۆم دەوێت. کاتێك بەیانی گەشت، حارس سوپاکەی خۆی رازاندەوە و بۆ شەڕ هانیدان و ئەوان چل هەزار پیاوی شەڕکەر بوون. ئەوان بۆ شەڕ ریزیان بەست. شەڕێکی سەختیان کرد و مونزەر تیایدا کوژرا و سوپاکەی شکستیان خوارد. حارس فەرمانیدا دوو کوڕە کوژراوەکەی هاوشێوەی دوو تای بار بخەنە سەر وشترێك. مونزەری هاوشێوەی سەربار خستە سەریان و وتی: سەربارێك لەسەر دوو تابار. ئەم قسەیە بوو بەپەند. ئەو بەرەو حیرە بەرێکەوت و تاڵانی کردو ئاگری تێبەردا. دوو کوڕەکەی لەوێ بەخاك سپارد و دوو (غری)لەسەر ئارامگاکەیان دروست کرد. دەستەیەك لەمێژونوسان ئامازەیان بەمە داوە. باوکی رەعلای زوبەیانی لەمبارەوە دەڵێت:

کم ترکنا بالعین عین اباغ من ملوك و سوقة اکفاء

امطرتهم سحابة الموت تتری ان فی الموت راحة الا شقیاء

لیس من مات فاستراح بمیت انما المیت میت الاحیاء

واتاکەی: لەعەین یانی عەین ئۆباغ پاشاکان و خەڵکانێکی هاوتا لەتەپەکانمان لەناو خاك و خوێندا بەجێهێشت. هەوری مەرگ بەردەوام بەسەر ئەواندا باری، مەرگ دەبێتە هۆکاری ئاسودەیی خراپەکاران. ئەوەی بمرێت و ئاسودە بێت، مردوو نییە، مردوو ئەوەیە لەناو زیندووەکاندا دەژیت بەلاّم گیان و ناخ و ئەندێشەی خەوتووە.

## شەڕی مەرج حەلیمە

کاتێك، بەهەمان شێوەکە ئاماژەی پێدرا، مونزەر کوڕی ما السما لەناچوو، کوڕەکەی مونزەر بەپاشایەتی گەشت. ئەویان بەئەسوەد (ڕەش) ناودەبرد. کاتێك هێزی سەقامگیر بوو، سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و بۆ تۆڵەسەندنەوەی باوکی ڕۆشتە شەری حارس ئەعرەج. ئەو پەیامی بۆ حارس نارد: بۆ شەڕ لەگەڵ تۆ، پیرەپیاوە شارەزاکانم سوار لەسەر ئەسپە چالاکە نێرەکان ئامادە کردووە. حارس وڵامی دایەوە: من گەنجەکانم سوار لەسەر ئەسپە بلەزەکان بۆ شەڕی تۆ ئامادە کردووە. مونزەر بەرێکەوت تا لەمەرج حەلیمە دابەزی. لەم کاتەدا ئەو دەستە لەدێهاتییەکان کەبەرەچەڵەك غەسانی بوون، ئەو ناوچەیان بۆ ئەسوەد بەجێهێشت. نێرەیان بەناوی حەلیمە کچی حارسی غەسانی ناو نا. دوای ئاماژە دان بەم شەڕە ئاماژە بەم بابەتەیش دەدەین.

دواتر حارسیش بەرێکەوت و لەمەرج حەلیمە دابەزی. ئەو فەرمانی بەدێهاتییەکانی مەرج دا خواردن بۆ سوپاکەی ئامادە بکەن. ئەوان ئەم کارمیان کرد و خواردنیان لەناو دیگە گەورەکاندا هێنا و لەلەشکرگا بەجێیان هێشت. کار گەشتە ئەو شوێنەی هەر کەس دەیویست شەڕ بکات، ئازادانە ئەهاتە سەر دیگەکان وتێرسکی، خواردنی دەخوارد. شەڕی نێوان حارس و ئەسوەد چەندین ڕۆژی خایاند بەلاَم هیچ کام بەسەر ئەویتر دا سەرنەکەوت. کاتێك حارس ئەمەی بینی لەکۆشکە بەشکۆکەی خۆی دانیشت و کچەکەی هیندی بانگ کرد و فەرمانیدا ئەندازەیەکی زۆر بۆنی خۆش لەسەر و سینەی سپی و بلورینی خۆی بپرژێنێت و لەو بۆنە خۆشە بکاتە ناو دیگەکان و هاورێکانی بۆنخۆش بکات. دواتر حارس جاڕیدا: ئەی لاوەکانی غەسان، هەرکام لەئێوە پاشای حیرە بکوژێت کچەکەم هند دەکەم بەهاوسەری. لوبەید کوڕی عەمرۆ غەسانی بەباوکی وت: ئەی باوکە، من پاشای حیرە دەکوژم یا بەناچار لەبەرابەر ئەو دەکوژرێم. من لەئەسپەکەی خۆم رازی نیم، ئەسپەکەی خۆت( زەیتییە) بدە بەمن تا سواری بم و شەڕ بکەم. باوك ئەسپەکەی خۆی پێدا.

کاتێك خەڵك رویان لەجەنگ کرد و ماوەیەك شەڕیان کرد. لوبەید هێرشی کردە سەر ئەسوەد و گورزێکی لێدا و لەئەسپەکەی فڕیدایە خوار و هاوەڵانی ئەسوەد بۆ هەر سوچ و قوژبنێك رایان کرد و شکستیان خوارد و هەڵاتن. ئەو هاتەخوار و سەری ئەسوەدی بڕی و روی کردە حارس. ئەو لەکۆشکەکەیدا سەیری دەکردن. لوبەید هات و سەری ئەسوەدی خستە بەردەم پێی حارس. حارس پێی وت: ئەوە کچە مامەکەت، وەریبگرە کەکردمە هاوسەری تۆ. لوبەید وتی: نا، من دەرۆم و هاوکاری خەڵکەکەم دەکەم و کاتێك گەڕانەوە، دەگەڕێمەوە. گەڕایەوە و روبەروی براکەی ئەسوەد بوویەوە کەخەڵك هاوکاریان دەکرد. شەڕی دەکرد و بەهەموو هێزیەوە هەوڵی دەدا. لوبەید رۆشتە پێش و شەڕی کرد و کوژرا. لەم شەڕەدا دوای ئەو شکستە کەس جگە لەو نەکوژرا. لەخمییەکان دوبارە شکستیان خوارد و لەهەموو شوێنێك کوشتار کران و غەسانییەکان لەگەڵ باشترین سەرکەوتنەکان گەڕانەوە.

دەڵێن: لەم رۆژەدا تەپ وتۆزێکی سەخت بەرزبوویەوە، ئەوەندە زۆر بوو کەهەتاوی داپۆشی و ئەستێرەکان دوور لەشوێنی هەڵاتنی خۆر، بۆ زۆربەی خەڵکان دەرکەوتن چوونکە ئەسوەد هەموو سوپای عێراقی هێنابوو و حارس هەموو عەربەکانی شام. ئەم شەڕە یەکێك لەناودارترین شەڕەکانی عەرەبە. یەکێك لەوتاردەرەکانی غەسان شانازی پێوەدەکات و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يوم وادى حليمة و از دلفنا | بالعناجيج و الرماح الظلماء |
| اذ شحنا اكفنا من رقاق | رق من وقعها سنا السحناء |
| و اتت هند بالخلوق الى من | كان ذا نجدة و فضل غناء |
| و نصبنا الجفان فى ساحة المر | ج فملنا الى جفان ملاء |

واتاکەی: لەشەڕی سەرزەمینی حەلیمە بەشمشێرە درەوشاوەکان و ڕمەکانی تینوی خوێنی خەڵکان پێشڕەویمان کرد. دەستی خۆمان لەو کۆیلانە پڕ کرد کە لەکەوتنی ئەوان سەنای سەحنا نەرم بوو. هیندی جوان روخسار هاتە پێش و بۆنی

خۆشی بۆ هەر کوژەرێکی رێزدار هێنا. دیگەکانمان لەپانتاییەکانی مەرج بەهێز کرد و رومان کردە دیگە پڕ لەخواردەمەنییەکان.

سەبارەت بەکوژرانی ئەو ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە کەئێمە ئاماژەیان پێ دەدەین.

دەستەیەك لەزاناکان دەڵێن: هۆکاری شەڕ ئەوەبوو حارس کوڕی ئەبی شیمری جەبەلە کوڕی حارس ئەعرەجی غەسانی لەکچی مونزەر کوڕی مونزەری لەخمی خوازبێنی کرد و خوازیاری ئەوە بوو شەڕی نێوان لەخم و غەسان کۆتایی پێبێت. ئەو کچەکەی، هیندی کردە هاوسەری ئەو. بەڵام کچ پیاوانی نەدەویست لەبەر ئەمە کارێکی لەگەڵ پێستی خۆی کرد کە وەك گولی دەرکەوت. بەباوکی وت: ئەمە پێستی منە و تۆ وەك دیاری من بۆ لای پاشای غەسان دنێریت؟ پاشا لەبەشودانی ئەو پەشیمان بوویەوە. دواتر حارس ناردی بەشوێن کچەکەدا و داوای کرد بەڵام باوك ئەوی راگرت و بیانوی هێنایەوە.

مونزەر بۆشەڕ هاتەدەر و حارس کوڕی ئەبی شیمر لەشکری بۆ حیرە نارد و ئەوێی تاڵان کرد و ئاگری تێ بەردا. کاتێك مونزەر ئەم هەواڵەی بیست، لەشەڕ گەڕایەوە و رەوانەی شەڕ لەگەڵ غەسان بوو. ئەم هەواڵە بەحارس گەشت و هاوەڵان و خەڵکەکەی کۆکردەوە و لەگەڵیانا بەرێکەوت. دوو لەشکر لەعەین ئۆباغ بەیەك گەشتن. بۆ شەڕ ریزیان بەست و شەڕ دەستی پێکرد و لەهەردوو لای شەڕکەر شەڕێکی قورس دەستپێکرد. باڵی راستی مونزەر هێرشی کردە سەر باڵی چەپی حارس. کوڕەکەی کەلەوێدا بوو، کوژرا. باڵ چەپ شکستی خوارد. باڵی راستی حارس هێرشی کردەسەر باڵی چەپی مونزەر و شەڕەکەرەکانی شکستیان خوارد و فەرماندەکەیان فەروە کوڕی مەسعود کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەبی رەبیعە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان کوژرا. غەسانییەکان لەناوەڕاستەوە هێرشیان کردە سەر مونزەر. هاوەڵانی مونزەر بۆ هەر سوچ و قوژبنێك بڵاوەیان لێکرد. لەوان کەسانێکی زۆر کوژران و ژمارەیەکی زۆر بەدیلی گیران. لەوانە منداڵەکانی تەمیم و دواتر لەمنداڵەکانی حەنەزلە سەد کەس ئەسیر کران کەیەك لەوان شەئس کوڕی عەبدە بوو. براکەی عەلقەمە کوڕی عەبدەی وتاردەر بەمیوانی رۆشتە لای حارس و داوای

ئازاد بوونی براکەی کرد. ئەوی بەهۆنراوەیەکی ناودار وەسف کرد کەسەرەتاکەی بەمشێوەیە:

طحابك قلب فة الحسان طروب   بعيد الشباب عصرحان مشيب
تكلفنى ليلى و قد شط اهلها   وعادت عواد بيننا وخطوب

لەم هۆنراوەدا دەڵێت:

فان تسألونى بالنساء فاننى   بصير بادواء السناء طبيب
اذا شاب رأس المرء اوقل ماله   فليس له من ودهن نصيب
يردن ثراء المال حيث و جدنه   و شرح الشباب عندهن عجيب
و قاتل من غسان اهل حفاظها   و هنب و قاش جاولت و شبيب
تخشخش ابدان الحديد عليهم   كما خشخشت يبس الحصاد جنوب
فلم تنج الا شطبة بلجامها   و الا طمر كالقنباة نجيب
و الا كمى ذو حفاظ كانه   بما ابتل من حد الظبات خضيب
و فى كل حى قد خبطت بنعمة   فحق لشأس من نداك ذنوب
فلا تحرمنى نائلا عن جنابة   فانى امرؤ وسط القباب غريب

واتاکەی: لەناو جوان روخساران، دڵ گرفتار و شەیدای تۆ بوو و درەخشایەوە، چ دڵێکی سەوداگەر بوو! کەمێك دوای گەنجی و لەسەرەتایی پیری دڵت لەمن فڕاند. لەیلی بارێکی گرانی بۆ من بەجێ هێشت و کەسەکانی ئەو ستەمیان لەمن کرد، لەناو ئێمەدا پێشهاتەکان رویاندا و روداوە پشت شکێن و سەنگینەکان رویاندا. ئەگەر سەبارەت بەژنان لەمن بپرسیت دەبێت بڵێم لەگەڵ دەردی ژنان ئاشنام و پزیشکێکی وردبینم. کاتێك سەری پیاو سپی بێت یا سامانەکەی بەرەو کەمی بڕوات، ئەو لەخۆشەویستی ژنان بەشی نییە. ژنان لەهەر شوێنێك سامان ببینن، بەدوایدا ڕادەکەن. وسەرەتای جوانی لای ئەوان درەوشانەوەیەکی سەیرە. لەناو غەسانییەکان بەهێزەکانی ئەوان بوێرانە جەنگان، هەنب شەڕی کرد، قاس بۆ شەڕەکە هەوڵیدا و

شەبیب ئاگاداری شەڕەکە بوو. لەو ڕۆژەدا خوێناویەدا جگە لەئەسپێکی بڵندی بالآبەرز کەس رزگاری نەبوو، جگە لەئەسپێکی پێ پیرۆزی تیژپێ کە لەتیژی و چالاکی، لەرِم دەچێت، جگە لەدلێرپیاوێك کەوەك بڵێی ئەوەندە خوێنی دەرخواردی لێوارەکانی شمشێرەکەی خۆیداوە، سەر و روخساری خۆی بەخوێن رەنگ کردووە. تۆ لەناو هەر دەستەیەك، گەلآی زۆرت لەبەخشینەکانی خۆت بلآو کردۆتەوە. ئێستا شاس شیاوە لەبەخشینەکانی تۆ بەهرەیەك ببات. من لەدەرگای خۆت دوور و بێ هیوا مەکە چوونکە لەناو ئەم خێوەتانە بێ ئاشنام.

کاتێك گەشتە ئەم وتە کە(شاس شیاوە لەبەخشینەکانی تۆ بەهرەیەك وەربگرێت) پاشا وتی: ئەرێ بەخوا، ئەو شیاوە بەهرەکان ببات. ئەوسا شاسی ئازاد کرد و وتی: زیاد لەئازادی برادەر، داوای بەخشین بکە یائازادی خەلْکەکانت. پاشا بەهاونشینەکانی خۆی وت: ئەگەر بەخشین بخاتە پێش ئازادی دیلەکان لەخەلْکەکەی خۆی، هیوایەکی باشی لێناکرێت. بەلآم عەلقەمە کوڕی عەبەدە وتی: پاشا، من هیچ شتێك پێش خەلْکەکەی خۆم ناخەم. پاشا دیلەکانی لەخەلْکەکەی ئەو ئازاد کرد و ئەوی بەجل و بەرگی گرانبایی پۆشاند و سامانی پێدا. ئەو لەگەڵ هەموو دیلەکان ئەم کارەی کرد و توێشوی زۆری پێدان. کاتێك گەشتنە سەرزەمینەکەی خۆیان، هەموویان بەشاس بەخشی و وتیان: تۆ هۆکاری ئازادی ئێمە بوویت، ئێستا بەم زێرانە رۆژگاری خۆت بوگزەرێنە. سامانی زۆری لەوشتر و جل وبەرگی گرانبایی و شتیتر دەستکەوت.

هەروەها سەبارەت بەکوژرانی مونزەر وتویانە: ئەو سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و لەگەڵیا بەرێکەوت تا گەشتە شام. پاشای شامیش کەبەوتەی زۆربەی مێژوونوسان حارس کوڕی ئەبی شیمر بوو، بەرێکەوت و لەمەرج حەلیمە دابەزی. ئێرەیان بەناوی حەلیمە کچی پاشا ناوناوە. پاشای لەخمی لەمەرج سۆفر دابەزی. حارس دوو سواری وەك پێشەنگ رەوانە کرد. یەکێك لەم دوو سوارە (خەساف) بوو. ئەسپی ئەو لەگەڵ سێ ئەسپ غاریدەدا بەلآم هیچ کامیان پێی نەدەگەشت. ئەو دوانە هاتن و لەگەڵ لەخمییەکان (عێراقیەکان) تێکەلآو بوون و لەپاشا نزیك بوونەوە. لەبەرابەر ئەودا مۆمێك دەبینرا کەپارێزەرەکەیان کوشت. خەلْك ترسان و شمشێرەکانیان

لەکالأن دەرکێشا و کوشتاری یەکیان کرد تا بەیانی هات. لەم کاتەدا نێردراوانی پاشای غەسان هاتن و باجیان هێنا و داوای ئاشتیان کرد. پاشای شام پەیامی دا: من سەرۆکی هۆزەکان بۆ لای تۆ دەنێرم و چۆنیەتی بۆ تۆ باس بکەن. سەد کوڕی لاو ئامادە بوون. دەستەیەك دەڵێن، هەشتا کەس بوون. ئەو بەکەرەستەی شەڕ ئەوانی رازاندەوە و بەکچەکەی حەلیمەی وت کە جل وبەرگی جوانیان لەبەر بکات و بەبۆنی خۆش، بۆنخۆشیان بکات. کچ ئەو کارەی کرد کەباوك فەرمانیدابوو. کاتێك لوبەید کوڕی عەمرۆ سوارکاری ئەسپی زیتیە، لەبەردەم کچەکەوە تێپەڕی، ئەوی گرت و ماچی کرد. کچ گریان گەڕایەوە بۆ لای باوکی. باوك وتی: ئەو شێرە پیاوی ئەم خەڵکەیە و ئەگەر بەسلامەت رزگاری بێت تۆ دەکەمە هاوسەری ئەو. سوارەکان بەغاردان بەرێکەوتن. کاتێك لەسوپای عێراقی نزیك بوونەوە، پاشا گەورەکانی سوپا و گەورەکانی وڵاتی خۆی کۆکردەوە. غەسانییەکان هاتن. کەرەستەی شەڕیان پێبوو کە بەجل و بەرگی رازاوە و گرانبایی دایانپۆشیبوو. کاتێك هەموویان لای پاشای عێراق کۆبوونەوە، کەرەستەکانی شەڕیان ئاشکرا کرد و هەرکەسیان بینی کوشتیان. لوبەید کوڕی عەمرۆ پاشای عێراقییەکانی کوشت. لەولا ئەوان گەمارۆی غەسانییەکانیان دا و هەموویان کوشت تەنیا لوبەید کوڕی عەمرۆ رزگاری بوو چوونکە ئەسپەکەی لەپێ نەکەوت. سوار ئەسپەکەی بوو و بەغاردان هات و بەسەرهاتەکەی بۆ پاشا باس کرد. پاشا وتی: کچەکەم حەلیمە دەکەمە هاوسەری تۆ. لوبەید وتی: رازی نابم چوونکە خەڵکان دەڵێن: ئەو تەنیا هەڵاتووی سەد پیاوی شەڕکەربوو. دواتر بۆ گۆڕەپانی شەڕ گەڕایەوە و شەڕی کرد و کوژرا. عێراقییەکان بەدوای گەورەکانی خۆیان گەڕان و بینیان هەموویان کوژراون. لەبەر ئەمە سست و لاواز بوون و غەسانییەکان هێرشیان کردە سەریان و پەلاماریان دان.

من دەڵێم: رەچەڵەك ناسانی عەرەب و زاناکانی بەسەرهاتەکان سەبارەت بەدرێژی رۆژگاری شەڕەکان و لەپێش بوونی هەندێك لەوان لەدەستەیەکیتر، بەجیاوازی قسەیان کردووە. سەبارەت بەکوژرانیش گێرۆدەی جیاوازی بوون. دەستەیەك لەوان دەڵێن: رۆژی شەڕی حەلیمە هەمان رۆژە کەمونزەر کوڕی ما السما تیایدا کوژرا. رۆژی شەڕی ئۆباغ هەمان رۆژە کەمونزەر کوڕی مونزەر تیایدا کوژرا.

دەستەیەک دژی ئەمە دەڵێن. دەستەیەک هەردوو شەڕەکە بەیەک دەزانن و دەڵێن: جگە لەمونزەر کوڕی ما السما نەکوژرا و کوڕەکەی مونزەر کوڕی مونزەر لەحیرە مرد. دەستەیەک وتوویانە: کوژراوی پاشاکانی حیرە کەسێک جگە لەم دوانە بوو. راستییەکەی ئەوەیە کەبێ گومان مونزەر کوڕی ما السما کوژرا. بەڵام سەبارەت بەکوڕەکەی بیروبۆچونی جیاواز زۆرە و راستییەکەی ئەوەیە ئەو نەکوژراوە. ئەوان دەڵێن کوژرا، لەبارەی چۆنیەتی و هۆکاری کوشتنەکەی جیاوازییان هەیە بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا.

من لەبەر ئەوە ئاماژەم بەجیاوازییەکانی ئەواندا (هەرچەند رووداوەکە یەکێک بوو) چوونکە هەرکام لەهۆکارەکان یەکێک لەزاناکان ئاماژەی پێداوە. ئەگەر یەکیمان پشت گوێ دەخست ئەوەی ناناشنا بوو، گومانی دەکرد هەر هۆکار، رووداوێکی تایبەتە و ئێمە لەبیرمان کردووە. لەبەرئەمەبوو ئاماژەمان بەهەمووی دا.

## کوژرانی موزەڕت ئەلحجارە

ئەو عەمرۆ کوڕی مونزەر کوڕی ما السمای لەخمی پاشای حیرە بوو. ئەویان بە موزەڕت ئەلحجارە (گەوزێنەری بەرد) ناوبردووە، چوونکە هێزێکی تاببەت و زۆرداری بووە. دایکی هیند کچی حارس کوڕی عەمرۆ مەقسور ئاکل ئەلەرار بوو. ئەم ژنە بەپوری ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی حوجر کوڕی حارس هەژمار دەکرا.

هۆکاری کوژرانەکەی ئەوەبوو رۆژێك بەهاونشینەکانی خۆی وت: ئایا کەسێك لەعەرەبەکان لەخەڵکی ولاتەکەی من دەناسن کەدایکی خۆی بەلەوە بەرزتر بزانێت کەخزمەتی دایکی من بکات؟ وتیان: تەنیا کەسێك دەناسین کەعەمرۆ کوڕی کولسومی تەغلەبیە. دایکی ئەو لەیلی کچی موهەلهیلە و مامی ئەو کولەیب وایل و هاوسەرەکەی کولسوم و کورەکەی عەمرۆ کوڕی کولسومە. عەمرۆ کوڕی حارس بێدەنگ بوو و ڕقی ناخی خۆی خواردەوە. ئەو کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی کولسوم نارد و خوازیاری بینینی ئەو بوو، وتی: دایکت لەیلیش بێت و چاوی بەدایکی من بکەوێت. عەمرۆ کوڕی کولسوم هاورێ لەگەڵ سوارەکان و دایکی لەتەغلەب هات. ئەو لەسەر کەنارەکانی روباری فورات دابەزی. عەمرۆ کوڕی حارس (یا عەمرۆ کوڕی هیند) لەهاتنی ئاگادار و فەرمانیدا خێوەتەکان لەنێوان و فورات و حیرە هەڵبدەن. ئەو گەورەکان و سەرکردەکانی ولاتەکەی خۆی بانگ کرد و خواردنێکی پاکی ئامادە و دواتر خەڵکی بۆ سەر سفرەکەی بانگێشت کرد و لەخێوەتەکان خواردنی بۆ ئەوان هێنا. دایکی یانی هیند بارەگایەکی لەنزیك خێوەتەکە بوو. لەیلی دایکی عەمرۆ کوڕی کولسوم لەگەڵ ئەو لەبارەگاەدا بوو. عەمرۆ کوڕی حارس بەدایکی وتبوو: کاتێك خەڵك لەخواردن تەواو بوون و جگە لەخواردنە خۆشەکان هیچ نەمایەوە، نۆکەرەکان بنێرەدەر و کار بەلەیلی بکە تا بەردەوام خواردنی خۆش بەتۆ بدات.

هیند ئەوەی کوڕەکەی وتبووی بەکاری برد و کاتێك شیرینی و چەرەسیان هێنا، هیند وتی: یا لەیلی ئەو چینیە بدە بەمن. لەیلی وتی: هەر کەس کارێکی هەیە خۆی بەئەنجامدانی هەستێت. هیند پێداگری کرد. لەیلی وتی: ئاخ، هاوار

لەریسوایی! ئای تەغلەبییەکان! کوڕەکەی عەمرۆ کوڕی کولسوم ئەمەی بیست و خوێن لەروخساری کۆبوویەوە. ئەوان شەرابیان دەخواردەوە. عەمرۆ کوڕی هیند زیانی لەروخساری ئەو خوێندەوە. عەمرۆ کوڕی کولسوم روی کردە شمشێرەکەی عەمرۆ کوڕی هیند کە لەخێوەتەکە هەڵواسرابوو. لەوێ جگە لەو شمشێرە شمشێریتر نەدەبینرا. هەڵیگرت و کێشای بەسەر عەمرۆ کوڕی هیند و ئەوی کوشت. هاتەدەر و بانگی دا: ئای تەغلەبییەکان! ئەوان سوار بوون و خێوەتەکانی عەمرۆ کوڕی هیندیان تالاّن کرد و ژنانیان ئەسیر کرد و بەرێکەوتن و خۆیان گەیاندە حیرە. ئۆفنونی تەغلەبی وتی:

| | |
|---|---|
| لعمرك ما عمرو بن هند و قد دعا | لتخدم ليلى امه بموفق |
| فقام ابن كلثوم الى السيف مصلتا | و امسك عن ندمانه بالمخنق |

واتاکەی: بەگیانی تۆ سوێند کەعەمرۆ کوڕی هیند کاتێك لەیلی بانگ کرد تا نۆکەری دایکی بکات، بەختەوەر نەبوو. لەم کاتەدا عەمرۆ کوڕی کولسوم روی کردە شمشێرە هەڵواسراوە لەکێلان دەرکێشراوەکە و بەقورگی گیراو، لەخواردنەوە لەگەڵ هاونشینەکان دەستی هەڵگرت.

## یەکەم شەڕی کەلاب

کوڕی کەلبی دەڵێت: یەکەم کەس لەکێندیەکان کەپاشایەتی و فەرمانڕەوایەتی بەهێز و سەقامگیری بوونیات نا، حوجر ئاکیل ئەلمرار کوڕی عەمرۆ کوڕی مەعاویە کوڕی حارسی کێندی بوو. کاتێك مرد، دوای ئەو کوڕەکەی عەمرۆ هاوشێوەی باوکی فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەویان بە مەقسور (کورت) ناو بردووە چوونکە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەو کورتتر لەباوکی بوو (یاپانتایی فەرمانڕەوایەتییەکەی کەمتر لەباوکی بوو یابەهەمان پانتایی بەسەندەی کرد). ئەم عەمرۆیە لەگەڵ کچێك بەناوی ( دایکی ئوناس) کچی عەوف کوڕی موحەلەم شەیبانی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. ئەم ژن حارسی بۆ هێنایە دنیا کەدوای باوکی چل ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. دەستەیەك دەڵێن: ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی شەست ساڵی خایاند. رۆژێك بۆ راو رۆشتەدەر و روبەروی گایەلێك کەڵەکێوی بوویەوە و شوێنیان کەوت. لەناویان یەکیانی هەڵبژارد و شوێنی کەوت و کاتێك ئاژەڵەکە نەبووە نێچیری، سوێندی خوارد پێش لەخواردنی جگەری ئەو لێو بۆ هیچ خواردنێکی دیکە نەبات. تا (مەسحەلان) ڕۆشتە پێش. سوارەکان بۆ ماوەی سێ رۆژ بەدوایدا گەڕان و دۆزییانەوە. ئەویان بینی لەکاتێکدا لەمردن نزیك ببوویەوە. جگەری کەڵەکێوییێکیان هێنا و لەسەر ئاگر برژاندیان و بەگەرمی دەرخواردیاندا و دەست بەجێ گیانی سپارد. حارس کوڕەکانی لەناو هۆزە عەرەبەکان بڵاو کردبوویەوە و هەرکامی کردبوویە فەرمانڕەوایی هۆزێك: گەورەترین کوڕەکەی، حوجری کردە فەرمانڕەوای منداڵەکانی ئەسەد و کەنانە، شوڕەحبیلی کردە فەرمانڕەوا لەسەر بەکر کوڕی وایل و منداڵەکانی حەنزەلە کوڕی مالیك کوڕی زەید مەنات کوڕی تەمیم و منداڵەکانی ئەسید کوڕی عەمرۆ و منداڵەکانی تەمیم و هۆزی رەباب، بچوکترین منداڵی خۆی یانی سەلەمەی کردە فەرمانڕەوا لەسەر منداڵەکانی تەغلەب و نەمیر کوڕی قاست منداڵەکانی سەعد کوڕی زەید مەنات کوڕی تەمیم، کوڕەکەی مەعدی کەرب ناسراو بەناوی (غەلفا)ی کردە فەرمانڕەوا لەسەر قەیسی عەیلان. هەواڵی ئەم کارە لەداستانی

کوژرانی حوجر باوکی ئەمرۆ ئەلقەیس ئاماژەی پێدرا. لەبەر ئەوە لێرە ئاماژەمان پێدا چوونکە پێویستە.

کاتێك حارس مرد، کوڕەکانی بڵاو بوونەوە و قسەکانیان بوو بەچەند و ئاژاوەچییەکان کاریگەریان لەسەر دانان (هەرکامیان دژی ئەویتر هان دەدا). لەنێوان ئەو تیرانەی لەهۆزەکانی ئەوان بوون، لەجیاتی یەکیەتی، شەڕ کردن و پەلاماردانەکان بۆ سەر یەکتر هاتە ئاراوە و لە لەناوچوون و رووخان نزیك بوونەوە بەشێوەیەك هەرکام لەبەرابەر ئەویتر دەستی بەلەشکرکێشی کرد و بەسوپاکەی خۆی هێرشی کردە سەر بەرابەرەکەی. شەرەحبیل لەگەڵ پیاوە شەڕکەرەکانی خۆی بەرێکەوت و لەئاوگرێك لەنێوان بەسرە تا کوفە کە بەناوی کەلاب دەناسرا، دابەزی.

سەلەیش هاورێ لەگەڵ شەڕکەرەکانی خۆی، هاوری لەگەڵ (پەروەردەکراوەکان) هات. ئەم پەروەردە کراوانە دەستەیەك خەڵکی بێ رەچەڵەك و بەربڵاو بوون کەلەم لاولا کۆببوونەوە و دەوری پاشا عەرەبەکانیان گرتبوو. ئەمان رویان کردە کەلاب و فەرماندەی تەغلەبییەکان سەفاح کوڕی خالید کوڕی کەعب کوڕی زوهەیر بوو. دوو لەشکر بەدژواری روبەروی یەك بوونەوە و لەبەرابەر یەك خۆڕاگریان کرد. لەکۆتایی ئەو رۆژەدا، منداڵەکانی حەنزەلە و عەمرۆ کوڕی تەمیم و هۆزی رەباب دەستیان لەهاوکاری کردنی بەکر کوڕی وایل هەڵگرت و هەڵاتن. بەکرییەکان خۆڕاگریان کرد و منداڵەکانی سەعد و هاورێکانیان پشتیان کردە تەغلەبیەکان و تەغلەبیەکان خۆڕاگریان کرد. جارچی شەرحبیل جاریدا: هەر کەس سەری سەلە بێنێت سەد وشتری پێدەدرێت. جارچی سەلە جاریدا: هەرکەس سەری شەرەحبیل بێنێت، سەد وشتری پێدەدەم. لەم کاتەدا شەڕەکە زیاتر تەشەنەی سەند و هەر کەس هەوڵی پێش کەوتن و سەرکەوتنی دەدا تا بتوانێت یەکێك لەم دوو پیاوە بکوژێت و سەد وشتر بەدەست بێنێت. لەکۆتایی رۆژ، سەرکەوتن بەتەغلەب و سەلە برا و شەرەحبیل هەڵات. لەم کاتەدا، زوسنینەی تەغلەبی شوێنی کەوت. شەرەحبیل ئاوڕی بۆ دایەوە و شمشێرێکی لەئەژنۆیدا و قاچی قرتاند. زوسنینە زڕبرای باوکی حەنش بوو. ئەو بەبراکەی خۆی باوکی حەنشی وت: ئەم پیاوە منی کوشت. زوسنینە گیانی سپارد. باوکی حەنش بەشەرەحبیلی وت: خوا من بکوژێت ئەگەر تۆ نەکوژم. شوێنی

کەوت وپێی گەشتەوە. شەرەحبیل وتی: ئەی باوکی حەنش ، شیر، شیر! یانی خوێنبایی. باوکی حەنش وتی: شیری زۆرت رژاندۆتە سەر زەوی! شەرەحبیل وتی: ئایا دەتوانرێت پاشایەك لەخوێنی مسکێنێکدا بکوژرێت؟ باوکی حەنش وتی: براکەم پاشای منە. گورزێکی لەشەرەحبیل دا و ئەوی لەئەسپ خستە خوار، خۆیشی هاتە خوار، سەری بری وهەڵیگرت و دایە دەست کوڕە مامەکەی. هێنای و لەبەردەم سەلەدا خستیە سەر زەوی. سەلە وتی: خۆزگە ئەم سەرە بەرێزمت بەهێواشی دەخستە سەر زەوی! پەشیمانی و خەم و پەژارە لەروخساری سەلە دەرکەوت. ئەیو حەنش هەڵات و سەلە وتی:

| | |
|---|---|
| الا ابلغ ابا حنش رسولا | فمالك لا تجيء الى الثواب |
| لتعلم ان خير الناس طرا | قتيل بين احجار الكلاب |
| تداعت حوله جشم بن بكر | و اسلمه جعاسيس الرباب |

واتاکەی: یەکێك بۆ لای باوکی حەنش بنێرن و پێی بڵێن بۆ نایێت پاداشتەکەی وەربگریت. تا بزانی باشترین کوژراوەکان لەسەر زەوی ئەو کوژراوە بوو کەلەناو بەردەکانی کەلاب لەخاك و خوێندا تلا. پیاوانی جەشم کوڕی بەکر هاوکاریان کرد و سوك و پەستەکانی رەباب پشتیان تێکرد.

باوکی حەنش وەڵامی دایەوە وتی:

| | |
|---|---|
| احاذر ان اجيئك ثم تحبوو | حباء ابيك يوم صنيبعات |
| و كانت غدرة شنعاء تهفو | تقلدها ابووك الى الممات |

واتاکەی: دەترسم بێمە لای تۆ و ئەو کاتە پاداشتی من بدمیت کە لەپاداشتە بێ شەرمانەکەی باوکت لەرۆژی سەنیبعات بچێت. فێڵێکی دزێو و قێزەون بوو کە لەسەردەستی باوکت کرا و تا سەردەمی مەرگ بە ملیەوە بوو.

هۆكاری شەڕی سەنیبعات ئەوە بوو یەكێك لەكوڕەكانی حارس بۆ شیرخواردن نێردرابوو بۆ ناو دوو هۆزی تەمیم و بەكر. مارێك پێوەیدا و مناڵەكە مرد. حارس پەنجا پیاو لەبەكر و پەنجا پیاوی لەتەمیم گرت و كوشتی. دوای كوژرانی شەرەحبیل، منالەكانی زەید مەنات كوڕی تەمیم هاوكاری ژن و منالەكانی ئەویان كرد و زیانی خەڵكیان لەوان دوور كردەوە و ئەوان پەیوەستی خەڵك و پەناگاكانیان بوون. كاتێك هەواڵی كوژرانی شەرەحبیل بەبراكەی مەعدی كەرب(غەلفا) گەشت، بۆ پرسەكەی ئەم هۆنراوەی وت:

دان جنبی عن الفراش لنابی | كتجافی الا سر فوق الظطراب
من حدیث نمی الی فما تر | قاعینی و لا اسیغ شرابی
مرة كالذعاف اكتمها النا | س علی حر ملة كالشهاب
من شرحبیل اذ تعاوره الار | ماح من بعد لذة و شراب
یا ابن امی و لو شهدتك اذتد | عو تمیما و انت غیر مجاب
ثم طاعنت من و رائك حتی | یبلغ الرحب او تبز ثیابی
احسنت وائل و عادتها الاحـ | ـسان بالنحو یوم ضرب الرقاب
یوم فرت بنو تمیم و ولت | خیلهم یكتسمن بالاذناب

واتاكەی: كەلەكەی من لەسەر جێگا بەئازار دێت و ڕەم دەكات هاوشێوەی وشترێكی بریندارى سینە زامدار كەلەسەر بەرد دەخەوێت، ئازار دەبینێت. ئەمە لەزیانی ئەو هەواڵەیە كە بەمن گەشت و ئێستا چاوەكانم لەگریان ناوەستن و شەراب بۆ من سازگار نابێت، هاوشێوەی شرنگی گیانبڕ تاڵە، خەڵكان دایانشارد و دەرخواردی منیان دا بەشێوەیەك لەتە ئاسنێك هەورەبروسكە ئاسا لەسەر ئاگری سور بكەنەوە و لەسەر جەرگی كەسێك دایبنێن. یادی شەرەحبیل بەرز بێت كاتێك ڕمەكان دەوریان گرتبوو و ئەمە دوای رۆژگارێك خۆش گوزەرانی و شەرابخۆری بوو. ئەی كوڕی دایكم، خۆزگە ئەو كاتە لای تۆ بووم كەداوای هاوكارت لەتەمیمیەكان دەكرد و وەلامت نەدەبیست. ئەوسا من بەدوای تۆ روم دەكردە شەڕ و رمم لەسینەكان دەچەقاند تا بكوژرێم یا بەئارەزوم بگەم یا جل و بەرگەكانم دوای كوژران بەتالان

ببەن. وایلییەکان پیاوانە چاکەیان کرد و چاکەکاری لەگەڵ ناشناکان عادەتی ئەوانە. ئەو رۆژەی تەمیمییەکان هەڵاتن و ئەسپەکانیان پشتیان کردە پەلاماردان و کلکیان دەلەقاند.

ئەمە هۆنراوەیەکی دوور و درێژە. ئەوسا تەغلەبییەکان سەلەیان لەناو خۆیاندا دەرکرد و ئەو رویکردە بەکر کوڕی وایل و پەیوەستی ئەوان بوو. تەغلەبییەکان پەیوەستی مونزەر کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس بوون.

## یەکەم شەڕی ئەوارە

ئەمە ئەوشەڕ بوو لەنێوان مونزەر کوڕی ئەمری ئەلقەیس وبەکر کوڕی وایل رویدا.

هۆکاری شەڕەکە بەمشێوە بوو: کاتێك تەغلەبییەکان سەلەیان لەناو خۆیاندا دەرکرد، ئەو پەنای بردە بەر هۆزی بەکر کوڕی وایل بەهەمان شێوەی ئێستا ئاماژەمان پێدا. کاتێك گەشتە ناوبەکرییەکان فەرمانیان لێبرد و لەدەوری کۆبوونەوە وپێیان وت: جگە لەتۆ کەس فەرمانرەوای ئێمە نەبێت. مونزەر پەیکی بۆ ناردن و دوای ملکەچی لێکردن. ئەوان سەریان دانەنەواند. مونزەر سوێندی خوارد کەبێ گومان هێرش دەکاتە سەریان ونەگەر بەسەریانا سەرکەوێت، یەك یەکیان لەسەر بەرزای کێوی ئەوارە سەر دەبڕێت تا خوێن بگاتە داوێنی کێوەکە.

لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی کردە سەریان. روبەروی یەك بوونەوە و شەڕێکی قورسیان کرد. شەڕ بەشکانی بەکرییەکان و ئەسیر بوونی یەزید کوڕی شورەحبیل کێندی کۆتایی هات. مونزەر فەرمانیدا و ئەویان کوشت. لەشەڕەکە، ژماریەکی زۆر لەخەڵکان کوژران. مونزەر ژمارەیەکی زۆری لەبەکرییەکان ئەسیر کرد و فەرمانیدا لەسەر بەرزایی کێوەکە بیانکوژن تا خوێن بگاتە داوێنی کێومکە. هەرچەندەیان کوشت، خوێن بەستی یا لەزەویدا ڕۆچو و نەگەشتە داوێن. بەمونزەریان وت: لەنفرین دور بیت، ئەگەر هەمووبەکرییەکان بکوژیت خوێن ناگاتە داوێنی کێومکە! شیاوە لەکاتی سەرِ برین خوێن بکەیتە سەر قوڕگیان تا خوێن بگاتە داوێنەکە (سوێندی پاشا بەجێ بێت). ئەو کاریان کرد و خوێناو بەداوێنی کێومکە گەشت. فەرمانیدا ژنەکانیان خستە ناو ئاگر و سوتاندیانن.

پیاوێك لەقەیس کوڕی سەعلەبە بەردەوام لەدەرباری مونزەر دەژیا. ئەو لەگەڵ مونزەر قسەی کرد و خوازیاری ئازاد کردنی دیلەکانی بەکر کوڕی وایل بوو. مونزەر ئەوانی ئازاد کرد. ئەعشا بۆ شانازی کردن بەنێوەنجیگەری قەیس لای مونزەر سەبارە بەبەکرییەکان هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| و منا الذی اعطاه بالجمع ربه | علی فاقة و للملوك هباتها |
| سبايا بنی شةيبان يوم اوارة | علی النار اذ تجلی له فتياتها |

واتاکەی: لەناو ئێمەدا ئەو کەسە دەبینرێت کەپاشاکەی بەخشینەکانی خۆی پێبەخشی کەسەخت نیازمەندی بوو و پاشاکان بەخشینەکانیان فراوانە. دیلەکانی منالّەکانی شەیبانیان لەرۆژی شەڕی ئەوارە هێنایە کوشتارگە و کچەکانیان دەخستە ناو ئاگر.

## دووەم شەڕی ئەوارە

عەمرۆ کوڕی مونزەری لەخمی یەکێك لەکوڕەکانی خۆی بەناوی ئەسعەد ناردە لای زەرارە کوڕی عودەسی تەمیمی تا پەروەردەی بکات. کاتێك گەورە بوو و گەشەی کرد، وشترێکی مێ لایەوە تێپەڕی و کوڕەکە بەهاروهاجی و لەخۆپەسەندیدا، تیرێکی بۆ گوانی خست و لەگوانی چەقی. خاوەنی وشتر پیاوێك بەناوی سومید لەمناڵەکانی عەبدولله کوڕی دارمی تەمیمی، هێرشی کردە سەر کوڕەکە و خوێنی ڕژاند وهەڵات و روی کردە مەککە و بووە هاوپەیمانی قورەیش. عەمرۆ کوڕی مونزەر پێش لەمە هاورێ لەگەڵ زەرارە ڕۆشتبووە شەڕ بەڵام سەرنەکەوتبوو. کاتێك گەشتە قەراغ دوو کوێستانی تەی، زەرارە پێی وت: هەر پاشایەك کەدەڕواتە شەڕ تا سەرنەکەوێت، ناگەڕێتەوە. روبکەرە هۆزی تەی چوونکە لای ئەوانی. ئەو هێرشی کردە سەریان ونەسیری گرت و کوشتی و تالآنی دەستپێکرد. لێرەوە خەڵکانی تەی ڕقیان لەزەرارە هەڵگرت. کاتێك سومید ئەسعەدی کوشت ( زەرارە لەم کاتەدا لای عەمرۆ کوڕی مونزەر بوو)، عەمرۆ کوڕی مێلقەتی تایی بۆ هاندانی ئەو دژەی زەرارە ئەم هۆنراوەی وت:

| | |
|---|---|
| من مبلغ عمرأ بأن الـ | ـمرء لم يخلق صبارە |
| ها ان عجزة امە | بالسفح اسفل من اوارە |
| فاقتل زرارة لا ارى | فى القوم او فى من زرارة |

واتاکەی: کێ ئەم پەیامە لەمن بەعەمرۆ کوڕی مونزەر دەگەیەنێت کەخەڵك لەئاسن دروست نەکراون. ئێستا سەرینی دایکی لەداوێنی کێوی ئەوارمیە. زەرارە بکوژە چوونکە لەناو ئەم خەڵکە ڕێزدارتر لەو نابینم.

عەمرۆ وتی: یا زەرارە دەڵێی چی؟ وتی: درۆیان بەتۆ وتووە و دوژمنی ئەوان لەگەڵ خۆت ئەزانی. عەمرۆ وتی: راستت وت. کاتێك شەو داهات، زەرارە بەپەلە بۆ

لای خەڵکەکەی خۆی غاریدا و زۆری نەخایاند نەخۆش کەوت. کاتێك بینی مەرگی نزیك بۆتەوە، بەکوڕەکەی وت: ئەی حاجب، کۆیلەکانی من بەمناڵەکانی نەهشەل بسپێرە. بەکوڕی براکەی عەمرۆ کوڕی عەمرۆی وت: لەسەر تۆ بێت کەعەمرۆ کوڕی مێلقەت لەناو ببەیت چوونکە ئەو پاشای دژی من هاندا. کوڕ وتی: مامە گیان دووترین کەسی دووردەست و بەهێزترینیانت بۆ من هەڵبژارد.

دوای مردنی زەرارە عەمرۆ کوڕی عەمرۆ لەگەڵ دەستەیەك ئامادەی شەڕ بوو و هێرشی کردە سەر تەی و شەڕی لەگەڵ کردن و دوو تەریفی کوشت: تەریف کوڕی مالیك و تەریف کوڕی عەمرۆ. مێلقەتیش کوژرا. عەلقەمە کوڕی عەبدە ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

و نحن جلبنا من ضرية خيلنا نجنبها حد الاكام قطاقطا

اصبنا الطريف و الطريف بن مالك و كان شفا الواصبين الملاقطا

واتاکەی: ئێمە ئەسپەکانمان لەناو دڕندەکان کێشایە دەر و ئەوانمان لەوردە بارانەکان لای تەپۆڵکەکان دوور کردەوە. تەریف کوڕی عەمرۆ و تەریف کوڕی مالیکمان کوشت بەلاّم ئەوەی بووە هۆی ئاسوودەی دڵی داغداران مەلاقیت بوو.

کاتێك هەواڵی مردنی زەرارە بەگوێ عەمرۆ کوڕی مونزەر گەشت، ڕۆشتە شەڕی مناڵەکانی دارم کەسوێندی خواردبوو سەد کەس لەوان لەجیاتی کوڕەکەی ئەسعەد بکوژێت. ئەو ڕۆشت و گەشتە کوێستانی ئەوارە و بینی (دارمیەکان) هەواڵی هاتنی ئەویان بیستووە و لەترسا بلآومیان لێکردووە. لەشوێنەکەی خۆیدا مایەوە و چەندین دەستەی بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد. نەوەد و نۆ کەسیان بۆ ئەو هێنا و ئەمە زیاد لەو کەسانە بوو لەهێرشەکانی خۆیان کوشتبوویان. ئەوانی کوشت. لەم کاتەدا وتاردەرێك لەبەراجیم هاتە لای تا وەسفی بکات. ئەو پیاوەی بەخت هەڵگراوەی گرت و کوشتی و سەد کەسی تەواو کرد. دواتر وتی: بەدبەخت ئەو

کەسەی لەبەراجیمەوە دێت. ئەم قسەیە بوو بەپەند.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئاگاداری کردنەوە کەئەوان دەسوتێنێت و لەبەر ئەمە بە((محرق)) سوتێنەر ناو برا. نەوەد و نۆ کەس لەوانی سوتاند. لەم ناوەدا پیاوێك لەبەراجیمیم لەوێوە تێپەڕی و بۆنی گۆشتی سوتاوی کرد و گومانی کرد پاشا خواردنی ئامادە کردووە و کەبابی برژاندووە. مەبەستی ئەوێی کرد. پاشا وتی: تۆ کێیت؟ وتی: لە نفرین دور بیت، میوانێك لەبەراجیمم. پاشا وتی: بەدبەخت ئەو کەسەی لەبەراجیمەوە بۆ میوانی دێت. دواتر فەرمانیدا ئەویشیان خستە ناو ئاگرەوە. لەبەرئەمە فەرزدیق بۆ سەرکۆنە کردنی جەریری دەڵێت:

این الذین بنار عمرو احرقوا ام این اسعد فیکم المسترضع

واتاکەی: لەکوێن ئەوانەی بەئاگری عەمرۆ سوتان، ئەسعەد کەبۆ شیر خواردن هاتە ناوئێوە، بۆ کوێ رۆشت؟

لەمەبەدوا خەڵکان، تەمیمیەکانیان بەسك پەرەستی سەرکۆنە دەکرد چوونکەن پیاوی بەرجەمی چاوی تەماحی بڕیە کەباب بەلاّم لەئاگرەکەیدا سوتا. یەکێك وتی:

اذا مامات میت من تمیم فسرك ان یعیش فجیء بزاد
بخبز او بلحم او بتمر او الشیء الملفف بالبجاد
تراه ینقب البطحاء حولا لیاکل رأس لقمان بن عاد

واتاکەی: ئەگەر کەسێك لەتەمیم بمرێت و بتەوێت زیندوو ببێتەوە، توێشوێك بەرز بکەرەوە، نانێ، گۆشتێ، خورمایەك، یا شتێکی پێچراو لەجلێکی ڕاڕا. ئەو دەبینی کەسەراسەری بیابان لەیەك ساڵدا دەپێوێت تابێت و سەری لوقمان کوڕی عاد

بخوات (یا بیابان چاڵ دەکات تا سەری لوقمان کوڕی عاد بەدەست بێنێت و بیخوات).

دەستەیەك دەڵێن: ئەحنەف کوڕی قەیس هاتە لای معاویە کوڕی ئەبو سوفیان و معاویە پێی وت: ئەی باوکی بەحر، ئەو شتە پێچراوە لەجلی ڕاڕا چییە؟ وتی: خۆراکی گەرم. خۆراکی گەرمیان بەهۆکاری سەرکۆنە کردنی قوریشیەکان دەزانی (ئەحنەف لەم ڕێگاوە سەرکۆنەی معاویەی کرد) بەهەمان شێوە کەتەمیمیەکانیان بەخۆراکی پێچراوە لەجلی ڕاڕا سەرکۆنە دەکرد. لەم دوانە (ئەحنەف و معاویە) گاڵتەچیتر نەبینراوە.

## کوژرانی زوهەیر کوڕی جەزیمە و خالید کوڕی جەعفەر کوڕی کەلاب و حارس کوڕی زالم ئەلموری و شەڕی ڕەحرەحان

زوهەیر کوڕی جەزیمە کوڕی ڕەواحە کوڕی ڕەبیعە کوڕی مازین کوڕی حارس کوڕی قەتیعە کوڕی عەبسی عەبسی (کەباوکی قەیس کوڕی زوهەیر فەرماندەی شەڕی داحس و غەبرا بوو)بەسەروەری هۆزی قەیسی عەیلان دەژمێردرا. بۆ ڕێز گرتنی گەورەیی وسەروەری ئەو، نەعمان کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس باوەگەورێی نەعمان کوڕی مونزەر کچەکەی کردە هاوسەری ئەو. جارێك نەعمان پەیکی بۆ لای زوهەیر نارد و خوازیار بوو یەکێك لەمناڵەکانی بۆ دیداری ئەو بنێرێت. ئەو شاس کوڕە گەورەی خۆی نارد. پاشا ڕێزی لێگرت و بەخششی پێدا و بەزێر ڕازاندییەوە. شاس هاتەدەر و مەبەستی خەڵکەکەی خۆی کرد و لەسەرئاوێك لەئاوەکانی غەنی کوڕی ئەعسەر دابەزی. ڕەباح کوڕی ئەشەلی غەنەوی کەئەوی نەدەناسی، ئەوی کوشت و زێر و باروبنەکەی تالآن کرد. بەزوهەیریان وت: شاس لای پاشا هاتەدەر و دوایین جار کەئەویان بینیوە لەسەرزەمینی خەڵکی غەنی بووە و ئەوان هاوپەیمانانی مناڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە بوون. لای زوهەیەر کۆبوونەوە، هەواڵی کوڕەکەی پرسی. سوێندیان خوارد کەهیچ هەواڵێکیان لەو نەبیستووە. زوهەیر وتی: بەلآم ئەزانم چی بەسەر هاتووە. باوکی عامیر پێی وت: چ شتێك تۆ لەئێمە ڕازی دەکات؟ زوهەیر وتی: یەك لەم سێ کارە، یا کوڕەکەم زیندوو بکەنەوە، یا مناڵەکانی غەنی بەمن بسپێرن تا لەجیاتی کوڕەکەم بیانکوژم، یا تا ئێمە بین و ئێوە بن لەنێوانماندا شەڕ بێت. وتیان: بۆ ئێمە هیچ ڕێگەیەکی دەرچوونت دانەنا. بەلآم زیندوو کردنەوەی کوڕەکەت جگە لەخوا کەس ناتوانێت. تەسلیم کردنی غەنی، ئەوان بەهەمان شێوە ڕێزی خۆیان دەگرن کەئازادەکان و بەلآم شەڕ، سوێند بەخوا ئێمە ڕەزامەندی تۆمان دەوێت نەتووڕەیی تۆ. ئەگەر دەتەوێت خوێنبایی دەدەین و ئەگەر بتەوێت بەدوای کوژەری کوڕەکەت بگەڕێ تا تەسلیم بەتۆی بکەین

یا لەخوێنەکەی خۆش بێت کە لەنێوان ئاشناکان و دراوسێکان ئەم بەخشینانە بەفیرۆ ناڕوات. وتی: جگە لەوەی وتم هیچم ناوێت. کاتێك خالید کوڕی جەعفەر کوڕی کەلاب زۆرداری زوهەیری بەسەر خالۆکانی خۆی (منالەکانی غەنی) بینی، وتی: سوێند بەخوا تا بەم رۆژە نەمبینیوە کەس بەسەر خزمەکانی خۆی ئاوا زۆرداری بکات. زوهەیر وتی: ئایا دەتەوێت لەتۆی وەربگرم و واز لەمنالەکانی غەنی بێنم؟ وتی: بەڵێ. زوهەیر گەڕایەوە و وتی:

فلولا کلاب قد اخذت قرینتی ... برد غنی اعبدا و مواليا
و لكن حمتهم عصبة عامرية ... يهزون فة الارض القصار العواليا
مساعير فی الهيجا مصاليت فی الوغی ... اخوهم عزيز لا يخاف الاعاديا
يقيمون فی دار الحفاظ تكرما ... اذا ما فنی القوم اضحت خواليا

واتاکەی: ئەگەر منالەکانی کەلاب نەدەبوون، بەرابەرەکەی خۆم دەگرت و خوێنی کوڕەکەم لێدەسەند و منالەکانی غەنیم دەکردە بەندە و کۆیلە. بەڵام دەستەیەکی گەورە و بەهێز لەعامرییەکان پارێزەری ئەوان بوون خەڵکانێك کە لەزەوی ڕمە کورت و بڵندەکان تەکان دەدەن. سەرسەخت لەشەڕ، شمشێروەشێن لەکاتی جەنگ، هاوپەیمانی ئەوان بەرێزە و لەدوژمن ناترسێت. لەماڵێکی پارێزراودا دەژین وبەرێز ژیان بەسەر دەبەن. بەم شێوە بن تەنانەت ئەو کاتەی زەویی ماڵەکانی ئەم خەڵکە خاڵی لەپیاو بێت.

دواتر لەتە گۆشتی دابەژنێك و رەوانەی کرد و فەرمانیدا کارەکەی خۆی بەنهێنی بهێڵێتەوە. گۆشتی مەڕێکی قەڵەوی پێدا. ئەوەی بۆ سەرزەمینی منالەکانی غەنی نارد تا دەرمانە بۆنەخۆشکەرەکان بکرێت و لەچارەنوسی کوڕەکەی بپرسێت. ژن بەرەو سەرزەمینی منالەکانی غەنی ڕۆشت و ئەوەی زوهەیر وتبووی، ئەنجامی دا. ڕۆشتە لای ژنی رەباح کوڕی ئەشەل و پێی وت: کچەکەم بەمێرد داوە و لەبەرابەر ئەم گۆشتە دەرمانی بۆنخۆشکەرەم دەوێت. ژنی رەباح دەرمانی بۆن خۆشکەرەی پێدا و ئاگاداری کردەوە کەمێردەکەی کوڕی زوهەیری کوشتووە. ژن بۆ لای زوهەیر

گەڕایەوە و لەم وتەیە ئاگاداری کردەوە. ئەو سوارەکانی خۆی کۆکردەوە و بەردەوام هێرشی دەکرد سەر منداڵەکانی غەنی و ژمارەکی زۆری لەوان کوشت. لەنێوان منداڵەکانی عەبەس و منداڵەکانی عامیر شەڕ دروست هاتە ئاراوە و کارەکەیان روی لەدژواری کرد.

دواتر زوهەیر لەمانگی حەرام ( کەتیایدا شەڕیان نەدەکرد) لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆی هاتەدەر و روی لەعەکاز کرد. چاوی بەخالید کوڕی جەعفەر کوڕی کەلاب کەوت. خالید پێی وت: ئەی زوهەیر، زیانی زۆرت لەئێمەدا. زوهەیر وتی: سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی هێزم بۆ تۆڵە سەندنەوە هەبێت ئەم کارە کۆتایی نایێت. هۆزی هەوازین هەر ساڵ لەعەکاز بەزوهەیر کوڕی جەزیمە باجیان دەدا و ئەو ستەمی لەوان دەکرد و دڵی ئەوان لێوانلێو بوو لەرق و بێزاری. خالید و زوهەیر بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە. خالید بۆ سەرزەمینی هەوازین رۆشت وپێش دوژمنەکەی خۆی گەیاندە ئەو سەرزەمینە و خەڵکی خۆی کۆکردەوە و بۆ جەنگ دژی زوهەیر خۆی ئامادە کرد. ئەوان وەڵامیان دایەوە و ئامادەی شەڕ بوون و هاتنەدەر و مەبەستی زوهەیریان کرد ولەسەر رێگای ئەو بۆسەیان نایەوە. زوهەیر رۆشت و لەکەنارەکانی سەرزەمینی هەوازین دابەزی. کوڕەکەی قەیس پێی وت: خێرا بەرێکەوە و ئێمە لەم سەرزەمینە رزگار بکە چوونکە لەدوژمن نزیکین. زوهەیر وتی: ئەی ترسەنۆك، من لەهەوازین دەترسێنیت و لەزیانی ئەوان دەترسیت؟ ئەوان باشتر لەهەر کەسێك دەناسم. کوڕەکەی وتی: سەرسەختی مەکە و گوێ لەقسەکانی من بگرە و ئێمە لەم سەرزەمینە ببەرەدەر چوونکە لەزیانی ئەوان دەترسم.

تومازیر کچی شەرید کوڕی رەباح کوڕی یەقزەت کوڕی عوسەییەی سەلی دایکی منالی زوهەیر بوو. یەکێك لەبراکانی ئەم ژنە خوێنی رشتبوو و بۆ سەرزەمینی منالەکانی عامر هەڵاتبوو. لەناو ئەواندا دەژیا. خالید ئەوەی وەك دیدەوان نارد تا لەسوپاکەی زوهەیر ئاگاداری بکاتەوە. ئەو هات و گەشتە سەرزەمینی زوهەیرییەکان. قەیس کوڕی زوهەیر ئاگاداری کارەکەی بوو و هاورێ لەگەڵ باوکی بڕیاردا بیگرن و دیلی بکەن و لەگەڵ خۆیاندا ببەن تا لەسەرزەمینی هەوازین دوور بکەونەوە. خوشکەکەی ئەوانی لەم کارە دوور خستەوە. ئەوان سوێند و پەیمانیان

لێوەرگرت کەهیچ نەڵێت. ئەویان ئازاد کرد. ئەو ڕۆشتە لای خالید و لەپاڵ دارێکدا وەستا و هەموو شتەکانی بەدارەکە وت (تا سوێندەکەی نەکەوتبێت). خالید و هاوەڵانی سوار بوون و مەبەستی زوهەیریان کرد. لێیانەوە دوور نەبوو. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و خالید و زوهەیر روبەڕوی یەك بوونەوە و شەڕەکەیان درێژەی کێشا. باوەشیان بەیەکا کرد و هێزیان تاقی کردەوە و سەرئەنجام هەردووکیان کەوتنە سەر زەوی. وەرقا کوڕی زوهەیر پەلاماری خالیدا دا و بەشمشێر هێرشی کردەسەر بەڵام نەکوژرا چوونکە خالید دوو زرێی پۆشیبوو. لەم کاتەدا جۆندەح کوڕی بەکا، کوڕی ژنەکەی خالید هێرشی کردە سەر زوهەیر و کوشتی. خالید لەژێر پەیکەری ئەو هەستا و منالەکانی هەوازین بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. کوڕەکانی زوهەیر لاشەی باوکیان هەڵگرت و بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. وەرقا کوڕی زوهەیر لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| رأيت زهيرا تحت كلكل خالد | فاقبلت اسعى كالعجول ابدر |
| الى بطلين يعتران كلا هما | يريد رياش السيف و السيف نادر |
| فشلت يميني يوم اضرب خالدا | و يمنعه منى الحديدا لمظاهر |
| فياليت انى قبل ايم خالد | وز قبل زهير لم تلدنى تماضر |
| لعمرى لقد بشرت بى اذ ولدتنى | فما ذا الذى ردت عليك البشائر |
| فلا يدعنى قومى ضريحا بحرة | لئن كنت مقتولا و يسلم عامرا |
| فطر خالد ان كنت تسطيع طيرة | تفارق منها العيش و الموت حاضر |

واتاکەی: زوهەیرم لەژێر پەیکەری سەنگینی خالیدا بینی و بەپەلە بەرەو لایان ڕۆشتم بۆ ئەوەی کارێك کەبم. بەرەو لای دو پاڵەوان رام کرد کەباوەشیان بەیەکدا کردبوو و بەدوای شمشێردا دەگەڕان و شمشێری لێ نەبوو. دەستی راستم وشك بێت کەئەو ڕۆژەی بەشمشێر لەخالیدم دا و ئاسنی بەهێز ئەوی لەزیانی شمشێرەکەم پاراست و رزگاری کرد. خۆزگە تومازیر پێش لەڕۆژی شەڕی خالید و زوهەیر منی نەدەهێنایە دنیا. بەگیانم سوێند ئەو کاتەی منت هێنایە دنیا، مژدەی زۆریان

پێدایی، ئێستا راست بڵێ کەمژدەکان هاتنە دی یانە. نەکا خەڵکان من بەئازاد زادە بانگ بکەن. ئەگەر بکوژرێم و عامیر زیندوو رزگاری بێت. ئەی خالید، ئەگەر ئەتوانی هەڵفرێت، بفڕە و بەترسەوە بخەوە. ئەگەر زیندوو بمێنیت وابێت کەمەرگەکان بەزەربەیەك رووبکەنە تۆ و بەهۆیەوە ماڵئاوایی لەژیان بکەیت و مەرگ، ئامادەی گرتنی تۆبێت.

خالید ئەم قسانەی وت و منەتی کردە سەر هوازین کەدوژمنی ئەوان زوهەیری کوشتووە:

| | |
| --- | --- |
| ابلغ هوازن کیف تکفر بعد ما | اعتقتهم فتوالدوا ابکارا |
| و قتلت ربهم زهیرا بعد ما | جدع الانوف و اکثر الاوتارا |
| و جعلت مهر نسائهم و دیاتهم | عقل الملوك هجائنا و بکارا |

واتاکەی: پەیام بەهەوازین بگەیەنە چۆن ناسپاسی دەکەن دوای ئەوەی ئەوانم ئازاد کرد و ئەوان بەئازادی دەستیان بەزاوزێ کرد. سەروەری ئەوان زوهەیرم کوشت وئەمە دوای ئەوەی لووتی زۆر کەسی لەزەویدا و کەسانی زۆری دڵ سوتاو کرد. مارەیی ژنان و خوێنبایی ئەوانم لەخوێنبایی پاشا گەورەکان و کەسە سوکەکان دا.

زوهەیر سەروەری غەتەفان بوو. خالید زانی غەتەفانییەکان بەزووترین کات داوای خوێنی گەورەی خۆیان دەکەن. ئەو ڕۆشتە لای نەعمان کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس لەحیرە و داوای پەنای کرد و پێی بەخشرا. خێوەتێکی گەورەیان بۆ هەڵدا. منداڵەکانی زوهەیر کۆبوونەوە تا لەگەڵ هەوازین شەڕ بکەن. حارس کوڕی زالم مۆڕی وتی: ئێوە شەڕی هەوازین بەسەرکەووتویی کۆتایی پێبێنن تاخالید لەناو ببەم.

حارس بەرێکەوت و گەشتە لای نەعمان و ڕۆشتە لای و خالیدی بینی. ئەو دووانە خورمایان دەخوارد. نەعمان روی تێکرد، دەستی بە گفتوگۆ و پرسیار کردن کرد. خالید رژدی پێبرد و بەنەعمانی وت: لەنفرین بەدوور بیت، ئەمە پیاوێکە

قەرزێکی گەورە بەمن قەرزارە. من زوهەیر سەروەری غەتەفانم کوشت و ئەو بوو بەسەروەری غەتەفان. حارس وتی: بەزوترین کات قەرزەکەی خۆم دەدەمەوە. حارس دەستی بەخورما خواردن کرد بەلآم لەڕقی زۆر خورما لەدەستی دەکەوتە خوار. عوروە بەخالیدی برای وت: بۆ قسەت لەگەڵ کرد؟ ئەو پیاوێکی خوێنرێژ و پیاوکوژە. خالید وتی: چ ترسێکم لەوبێت؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەخەودا بمبینێت ناتوانێت خەبەرەم بکاتەوە. خالید و براکەی هاتنەدەر و ڕۆشتنە خێوەتەکەی خۆیان و بەندەکانیان بەست. خالید خەوت و عوروە بەئاگا مایەوە و پاسەوانی لێکرد. کاتێك شەوی ڕەش و تاریك داهات، حارس بەرەو لای خالید ڕۆشت و بەندی خێوەتەکەی پچراند و بەعوروەی وت: ئەگەر قسە بکەیت تۆیش دەکوژم. دواتر خالیدی لەخەو هەستاند. کاتێك هەستا، وتی: من دەناسیت؟ وتی: حارسیت. وتی: ئێستا قەرزەکەی خۆت لەمن وەربگرە. ئەوی بەشمشێرە دەرکێشراوەکەی خۆی کوشت و لەخێوەتەکە هاتەدەر و سوار لەسەر ئەسپ غاریدا.

عوروە لەخێوەتەکە هاتەدەر و بانگی دادخوازی بەرز کردەوە و ڕۆشتە بەردەم ماڵی نەعمان و ئاگاداری کردەوە. ئەو پیاوەکانی بەدوای حارسدا نارد.

حارس دەڵێت: کاتێك کەمێك دوورکەوتمەوە، ترسام خالیدم نەکوشتبێت، لەبەر ئەمە بەنەناسراوی گەڕامەوە و تێکەڵ بەخەڵکان بووم و ڕۆشتمە خێوەتەکەی خالید و جارێکیتر بەشمشێر لێمدا تا ئەوەی لەکوژرانی دڵنیا بووم.

نەعمان بەدوای حارسدا دەگەڕا تا لەبەرابەر پەنابەرەکەی خۆیدا بیکوژێت و هوازین بەدوایدا دەگەڕان تا لەبەرابەر کوشتنی سەروەرەکەی خالید، ئەو لەناو بەرێت. حارس پەیوەستی زەمرە کوڕی زەمرە کوڕی جابر کوڕی قەتن کوڕی نەهشەل کوڕی دارم بوو و ئەو لەبەرابەر نەعمان و هوازین پەنایدا. کاتێك نەعمان زانی، لەشکرێکی رازاندەوە و کوڕی خەمسی تەغلەبی وەك فەرماندەیی دیاری کرد و بۆشەڕی منالەکانی دارمی نارد. حارس دەیویست تۆڵەی خوێنی باوکی بکاتەوە.

دواتر ئەحوەس کوڕی جەعفەر برای خالید، عامیرییەکانی کۆکردەوە و ئەوانی لەگەڵ خۆیبرد. ئەم سوپایە لەگەڵ سوپاکەی نەعمان بۆ شەڕی منالەکانی دارم یەکیان گرت. پێشڕەوییان کرد و کاتێك گەشتنە نزیکترین ئاوەکانی منالەکانی دارم،

ژنێکیان بینی کارگی هەڵدەکەند. وشترێکی لەگەڵدا بوو. یەکێك لەپیاوەکانی غەنی ئەوی گرت و لای خۆی رایگرت. کاتێك شەو داهات، ژن رۆشتە لای وشترەکەی، سوار بوو و بەغاردان دوور کەوتەوە وبەرەبەیان گەشتە لای منالەکانی دارم و مەبەستی سەرۆکەکەیان زەرارە کوڕی عەدەسی کرد، هەواڵەکانی بۆ گێرایەوە وتی: دوێنێ کەسانێك منیان گرت کەنەمدەناسین بەلاّم بێ گومان مەبەستی کوشتنی تۆیان هەیە. زەرارە وتی: وەسفیان بکە. ژن وتی: پیاوێکم دی برۆکانی وەریبوون و ئەویان بەدەستارێك دەبەست. چاوی بچوکی هەیە و هەمووان لەو فەرمان دەبەن. زەرارە وتی: ئەو ئەحوەسە و سەروەری خەڵکەکەیەتی. ژن وتی: پیاوێکم بینی کەم قسەی دەکرد و کاتێك زمانی دەکردەوە، هەموویان لەدەوری کۆدەبوونەوە بەهەمان شێوە کەوشترە مێچکەکان دەوری وشتری نێری بەهێز دەگرن. جوانترینی پیاوەکان و دوو کوڕی لەگەڵدا بوو کەلێ جیانەدەبوونەوە. زەرارە وتی: ئەو مالیك کوڕی جەعفەر هاوڕێ لەگەڵ دوو کوڕەکەی عامیر و توفەیلە. ژن وتی: پیاوێکیتری بەهێز و چوارشانەم بینی دەتوت ریشی سوور و زەردە. زەرارە وتی: عەوف کوڕی ئەحوەسە. ژن وتی: پیاوێکی دیکەم بینی بالاّبەرز، بەهێز و زۆرخۆر. زەرارە وتی: رەبیعە کوڕی عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر کوڕی کەلابە. ژن وتی: پیاوێکیترم بینی ڕەش و کورت کەلوتێکی داچەقیوی ئاوساوی بوو. زراره وتی: رەبیعە کوڕی قۆرت کوڕی عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکرە. ژن وتی: پیاوێکی دیکەم بینی برۆ پەیوەست و سمێڵێکی پڕو کاتێك قسەی دەکرد، ئاوی دەمی دەکەوتە سەر ڕیشی. زەرارە وتی: جۆندح کوڕی بەکایە. ژن وتی: پیاوێکی ترم بینی چاوی بچوك و ناوچاوانی گرژ و هەوساری ئەسپەکەی لەدەست تیردانێکی دارینی بێ پێست ( یا پێستی بێ دار) کە لەدەستی دووری نەدەکردەوە. زەرارە وتی: رەبیعە کوڕی عوقەیل کوڕی کەعبە. ژن وتی: پیاوێکم بینی دوو کوڕی سور و سپی بوو، کاتێك دەهاتن خەڵك بەچاوی رێزەوە سەیری ئەو دوانەیان دەکرد و کاتێك دەگەڕانەوە و پشتیان لەخەڵك دەکرد هەمان هەڵس وکەوتیان لەگەڵ دەکردن. زەرارە وتی: سەعق کوڕی عەمرۆ کوڕی خومیلد کوڕی نۆفەیلە و ئەو دوو کوڕە یەزید و زەرعەن. ژن وتی: پیاوێکی دیکەم بینی قسەکانی لەتیغ تیژتر بوو. زەرارە وتی: عەبدوللە کوڕی جەعدە کوڕی کەعبە.

زەرارە بەو ژنەی وت بڕواتەماڵەکەی خۆی. ئەوسا ناردی بەدوای شوانەکان و فەرمانیدا وشترەکان بێنن. ئەو کارەیان کرد. فەرمانیدا ژنان کەرەستە و کەل و پەلی ژیانیان باری وشترەکان بکەن و بەرەو سەرزەمینی بەغیز بەرێبکەون. ئەوسا پەیکەکانی لەناو منداڵەکانی مالیك و منداڵەکانی حەنزەلەدا بلاّو کردەوە کە هاتنە لای و ئەوانی لەپێشهاتەکان ئاگادار کردەوە. بەوانی وت بنەماڵە و کەل و پەلەکانی خۆیان باری وشترەکان بکەن و بۆ سەرزەمینی بەغیزی بنێرن. ئەوسا هەموویان بۆ شەڕ ئامادە بوون.

منداڵەکانی عامیر شەویان کردە ڕۆژ و پیاوی غەنەوی هەواڵی ئەو ژنە وشتر سوارە و ڕاکردنی ئەوی لەشەودا گێڕایەوە. عامرییەکان شڵەژان و پەرێشان بوون و کۆبوونەوە و راوێژیان کرد. یەکێك وتی: دەزانم ئەو ژنە وشتر سوارە ڕۆشتۆتە لای خەڵکەکەی خۆی و لەهەموو شتێك ئاگاداری کردونەتەوە. بێ گومان ئەوان وشیار بوونەتەوە و ژنان و باروبنەی خۆیان بۆ سەرزەمینی بەغیز ناردووە و هەنوکە ئامادەی شەڕن و بەکەرەستەی شەڕ خۆیان تەیار کردووە. با سوار بین و شوێن کەل و پەل و سامانەکانی ئەوان بکەوین و تالاّنی بکەین چوونکە ئەوان ئاگادار نابنەوە تا ئەو کاتەی ئێمە کاری خۆمان ئەنجام دەدەین. سوار بوون و مەبەستی کەل وپەل و سامانی منداڵەکانی دارم و ژنانی ئەوانیان کرد. کاتێك زەرارە بینی دوژمن درەنگی کردووە بەخەڵکەکەی خۆی وت: ئەوان مەبەستی ژنان و وشترەکان و سامانەکانی ئێوەیان کردووە. بەرەو لای ئەوان غاربدەن. منداڵەکانی دارم بەغاردان ڕۆشتن و پێش ئەوەی ئەوان بەکاروان بگەن، ئەوانیان بینی و دەوریان گرتن. شەڕێکی قورس لەناو ئەواندا دەستی پێکرد. منداڵەکانی مالیك، حەنزەلە کوڕی خەمسی تەغلەبیان کوشت. ئەو فەرماندەی سوپای نەعمان بوو. منداڵەکانی عامیر، مەعبەد کوڕی زەرارەیان بەدیلی گرت. منداڵەکانی دارم خۆڕاگریان کرد تا ڕۆژ گەشتە نیوە و قەیس کوڕی زوهەیر و سوپاکەی گەشتن. منداڵەکانی عامیر و سوپاکەی نەعمان شکستیان خوارد و بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان گەڕانەوە و مەعبەد کوڕی زەرارە لەدەستی منداڵەکانی عامیر دیل بوو. تا کاتی مردنی لای ئەوان مایەوە.

لەو ڕۆژانەدا زەرارە کوڕی عەدەس مرد.

سەبارەت بەپەنا بردنی حارس بۆ مناڵەکانی تەمیم ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. بەم شێوەیە: نەعمان بەدوای بیانوێك دەگەڕا تا زیان لەحارس بدات چوونکە خالیدی کوشتبوو و هەڵاتبوو. پێیان وت: حارس مەبەستی حیرەی کردووە و ڕۆشتۆتە لای هاورێکەی خۆی عیاز کوڕی دەیهسی تەمیمی. نەعمان کەسەکانی خۆی بۆ ئەوێ نارد و وشترەکانی عیازی گرت. حارس بێ درەنگ سوار بوو و بەنهێنی هاتە حیرە و سامانەکانی عیازی لەوشتردارەکان وەرگرتەوە و بۆی گەڕاندەوە. بەدوای بیانوێك دەگەڕا تا زیان لەنەعمان بدات. کوڕەکەی ئەو غەزبانی بینی وبەشمشێر لێیدا و کوشتی. نەعمان ئاگادار بوویەوە و بەدوای حارسدا گەڕا بەڵام ئەوی نەدۆزییەوە. حارس لەمبارەوە وتویەتی:

اخصیی حماربات یکدم بجمة ... اتؤکل جاراتی و جارك سالم

فان تك اذوادا اصبت و نسوة ... فهذا ابن سلمی رأسه متفاقم

علوت بذی الحیات مفرق رأسه ... ولا یرکب المکره الا الاکارم

فتکت به کما فتکت بخالد ... و کان سلاحی تحتویه الجماجم

بدأت بتلك و انثینیت بهذه ... و ثالثة تبیض منها المقادم

حسبت ابا قابووس انك مخفری ... و لما تذق ثکلا و انفك راغم

واتاکەی: ئایا دوو گونی کەرێك دەبێتە هۆی ئازاردانی ئەستێرەیەك؟ ئایا دراوسێکانی من ئازار ببینن و دراوسێکانی تۆ بەسلامەت رزگارپیان بێت؟ ئەگەر تۆ زیانت لەخێوەتییەکان و ژنانت ئازاردا و ئەوانت ڕەنجاند، ئێستا سەیری ئەم کوڕە سەلمییە سەر براوە بکە. بەشمشێرێکی دوو سەر لەناوچاویم دا. جگە لەپیاوە گەورە و خاوەن شکۆکان کەس بەدوای کارە دژوارەکاندا ناڕوات. ئەوم کوشت بەهەمان شێوەی خالیدم کوشتبوو، کەرەستەکانی شەڕی من سەری سەردارەکان دەگرێتەوە. بەو یەکە دەستم پێکرد و ئەمەم کردە دووەم و کاتێك سێیەم بکوژم، ئازاکان لەترسا ڕەنگ دەدۆڕێنن. ئەی باوکی قابوس، گومانم برد تۆ پەنا دەری من بیت و هێشتا دڵ سوتاو نەبوویت و لوتت لەئەرز نەدرابوو.

بەمشێوەیە وتاری دەستەیەك لەوان. ئەوانیتر وتویانە: کوژرانی شەرەحبیل کوڕی ئەسوەد کوڕی مونزەر بوو. ئەسوەد کوڕی خۆی شەرەحبیلی لای سنان کوڕی ئەبی حارسە موری دانابوو تا ژنەکەی شیری پێبدات. لێرەوە سنان سامانی زۆری بەدەست هێنا. کوڕەکەی هیرەم لێی دەبەخشییەوە. حارس بەنهێنی هات وبەشێوەیەك کەسنان ئاگادار نەبوویەوە، زینەکەی ئەوی بەقەرز وەرگرت. دواتر هاتە لای ژنەکەی سنان و وتی: هاوسەرەکەت ئەڵێت شەرەحبیل کوڕی پاشا لەگەڵ حارس کوڕی زالم بنێرە تا لای ئەو پەنا بگرێت و ئەمە زینەکەی ئەوە کەنیشانێکی ڕاست بۆ ئەم پەیامەیە. ژن منداڵەکەی رازاندەوە و تەسلیم بەحارسی کرد. حارس ئەوی برد و کوشتی.

ئەسوەد ڕۆشتە شەڕی منداڵەکانی زۆبیان و منداڵەکانی ئەسەد لەشوێنێك بەناوی (شەتی ئەربەك) و کەسانێکی زۆری لەوان کوشت و دیلی گرت و سامانەکانیانی تالآن کرد و سوێندی خوارد بێ گومان حارس دەکوژێت. حارس بەنهێنی ڕۆشتە حیرە تا ئەسوەد بکوژێت. ڕۆژێك کە لەماڵەکەیدا بوو، هاواری ژنێکی دادخوازی بیست: دەیوت: من پەنام بۆ حارسی زالم هێناوە. حارس لەبەسەرهاتی ئەو ژنە ئاگادار بوویەوە کە گایەلێك لەوشترەکانی ئەوی بەزۆر داگیر کردبوو. حارس رۆشتە لای ئەو ژنە و پێی وت: بەیانی وەرە فلآن شوێن. حارس خۆی ڕۆشتە شوێنەکە و کاتێك وشترەکانی نەعمان سەرقاڵی لەوەڕین بوون، ئەوەی ملکی ژنەکەبوو، وەریگرت و پێی سپارد. لەناو ئەمانەدا وشترێك بەناوی ((لقاع))دەبینرا. حارس لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| اذا سمعت حنة اللقاع | فادع ابا ليلى فنعم الداعي |
| يمشي بعضب صارم قطاع | يفرى به مجامع الصداع |

واتاکەی: کاتێك بانگی لقاعت بیست، دەنگ هەڵبڕە و باوکی لەیلی بانگ بکە کە باشترین بانگ کردنە. بەردەوام بەشمشێرێکی تیژ و برمڕ بەرێدا دەڕوات و ناوچاوی نازاکان دەقلیشێنێت.

ئەوسا ڕۆشت و بەدوای پەنابەرێکدا گەڕا بەلآم کەس لەخەڵکان پەنای نەدا.

پێیان دەوت: کێ دەتوانێت تۆ لەهوازین و نەعمان پەنا بدات؟ تۆ کوڕی ئەوت کوشتووە. ئەو ڕۆشتە لای زەرارە کوڕی عەدەس و زەمرە کوڕی زەمرە و ئەم دووانە پەنایان پێدا.

دواتر عەمرۆ کوڕی ئیتنا خەزرەجی هەواڵی کوژرانی خالید کوڕی جەعفەری بیست. هاوڕێی بوو. عەمرۆ وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەو بێدار بوایە، ئەوی نەدەکوشت. خۆزگە چاوم بەو دەکەوت. وتەکەی بەگوێی حارس گەشت. وتی: سوێند بەخوا لەناو کەسەکان و سامانەکانی دەڕۆمە لای و چاوم پێی ناکەوێت مەگەر ئەوەی شمشێر و کەل و پەلەکانی شەڕی پێبێت. ئەم وتەیە بەگوێی کوڕی ئیتنا گەشت و ئەو چەندین دێر شێعری هۆنییەوە کەئەم دوانە لەوانە:

| | |
|---|---|
| ابلغ الحارث بن ظالم المو | ت و الناذر النذور عليا |
| انما تقتل النيام و لا تقـ | ـتل يقظان ذاسلاح كميا |

واتاکەی: پەیام بەگوێی حارس کوڕی زالم بگەیێنە و بەئاشکرا ئاگاداری بکەرەوە. تۆ خەوتوان دەکوژیت و ناڕۆیتە لای بێدار پیاوێکی ئازا و هەلگری شمشێر و ئامرازی شەڕ.

شێعرەکەی بەگوێی حارس گەشت. ئەو ڕۆشتە مەدینە و لەماڵی عەمرۆ کوڕی ئیتنای پرسی. کاتێك نزیکی بوویەوە وتی: ئەی کوڕی ئیتنا فریام کەوە. عەمرۆ هات وتی: کێیت؟ وتی: پیاوێك لە فلاّن هۆز. هاتمەدەر بڕۆمە لای خزمەکانم کەچەند کەسێك لەنزیکەکان هاتن و سامانەکەیان ڕفاندم. لەگەڵ من سوار بە با لێیان وەربگرینەوە. عەمرۆ لەگەڵی سوار بوو وجل و بەرگی شەڕی لەبەر کرد و بەرێکەوت.

کاتێك لەماڵی عەمرۆ دوور کەوتنەوە، حارس پێی وت. خەوی یا بەئاگایت؟

عەمرۆ وتی: بەئاگا. حارس وتی: من باوکی لەیلیم و ئەمە شمشێری من (معلوب) (دەرکێشراو، لەکالاّن دەرهاتوو). ئیتنا شمشێر یا ڕمەکەی خۆی هاویشت و

وتی: پەلەت کرد، دەرفەتم پێبدە تا شمشێرەکەی خۆم هەڵبگرم. حارس وتی: هەڵیگرە. عەمرۆ وتی: دەترسم پێش هەڵگرتنەوەی بمکوژیت. حارس کوڕی زاڵم وتی: سوێند و پەیمانی باوکم بۆ تۆبێت تا دەست بۆ شمشێرەکە نەبەیت و هەڵی نەگریت نەتکوژم. عەمرۆ کوڕی ئیتنا وتی: هەڵیناگرم! حارس لێی خۆش بوو وگەڕایەوە وتی:

| | |
|---|---|
| بلغتنا مقالة المرء عمرو | فالتقينا و كان ذاك بديا |
| فهممنا بقتله اذ برزنا | و وجدناه ذا سلاح كميا |
| غير مانائم يروع بالفتـ | ـكوري و لكن مقلدا مشرفيا |
| فمننا عليه بعد علو | بووفاء و كنت قدما وفيا |

واتاکەی: وتاری عەمرۆ کوڕی ئیتنا بەگوێمان گەشت و ئێمە چاومان بەیەك کەوت و دیار بوو چی ڕوودەدات. مەبەستی کوشتنی ئەومان لەکاتی ڕوبەڕووبوونەوە کرد و ئەومان بەئازایەکی شمشێر بەدەست بینی. خەوتوو نەبوو تا لەخەو هەستێت و لەمردن ڕەنگ بدۆڕێنێت بەڵکو دلێرێکی تەیار بوو کەشمشێری (مشرفي)(( دروستکراوی دێهاتەکانی مشرف))ی بەستبوو.

منەتمان خستە سەر و ئەمە دوای ئەوە بوو زاڵ بووین بەسەریدا. من لەکۆنەوە پارێزەری قسە و پەیمانی خۆم بووم.

کاتێك حارس زانی نەعمان بەدوایدا دەگەڕێت و هوازین دەست لەو هەڵناگرێت، نەناسراو ڕۆشتە شام و پەنای بۆ یەزید کوڕی عەمرۆ برد. یەزید پەنای دا و ڕێزی لێگرت. یەزید وشترێکی ڕاگرتبوو کەهیچ کەس بوێری زیان گەیاندن بەوی نەدەکرد. لەملی وشترەکەدا کێردێك و ئاگرگرمیەك و بڕێك خوێ بوو بۆ ئەوەی خەڵکەکەی پێ تاقی بکاتەوە ( ئەگەر ئەتانەوێت ئەم کێردە هەڵگبرن وشترەکە سەر ببڕن، یا بەم ئاگرگرە ئاگر بکەنەوە و گۆشتی وشترەکە ببرژێن و خوێی پیاکەن وبیخۆن). ژنەکەی حارس بێزوی بەگۆشت و چەورییەوە کرد. حارس ئەو وشترەی هەڵگرت و بردییە دۆڵێك و کوشتی و لەچەوری و گۆشتەکەی بۆ ژنەکەی برد و

بڕێکی زۆرتری بۆ نیازی خۆی هەلگرت. بەشوێن مێچکە وشترەکەدا گەڕان و سەربڕاو لەدۆڵەکەدا دۆزییانەوە. پاشا ناردی بەدوای کاهین (فالگیر، پێشگۆ) وبەسەرهاتەکەی لەو پرسی. کاهین وتی: حارس ئەوی کوشتووە. پاشا ژنێکی بەدەرمانی بۆنخۆش کەر نارد تا بەهۆیەوە گۆشتی وشتر لەژنەکەی حارس بکرێت. حارس چاوی بەو ژنە کەوت و بینی گۆشتی کڕیوە. ئەوی کوشت و لەماڵەوە دەفنی کرد. پاشا سەبارەت بەو ژنە لەکاهینی پرسی. وتی: کەسێك ئەوی کوشت کەوشتری سەربڕی. ئەگەر حەز ناکەیت ماڵەکەی بگەڕێیت، فەرمان بدە بڕواتەدەر و من بڕۆم و ماڵەکە بگەڕێم وپەیکەری ئەو ژنە بێنمەدەر. حارس ئەو کارەی کرد. کاتێك حارس رۆشتەددر، کاهین ماڵەکەی گەڕا و پەیکەری ژنەکەی هێنایەدەر. حارس دڵنیا بوو لەوەی زیانی پێدەگات. گەڕایەوە و کاهینی کوشت. حارسیان گرت وبردیانە لای پاشا. فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. حارس وتی: پەنات بەمن داوە، پەیمانەکەی خۆت مەشکێنە. پاشا وتی: ئەگەر من یەك جار پەیمان شکێنی لەگەڵ تۆدا بکەم، تۆ هەزاران جار فێڵت کرد و پەیمانت شکاند. ئەوی کوشت.

## شەڕی داحیس و غەبرا لەنێوان عەبەس و زۆبیان

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو قەیس کوڕی زوهەیر کوڕی جەزیمەی عەبەسی ڕۆشتە مەدینە تا بۆ شەڕ لەگەڵ عامرییەکان ئامادە بێت و تۆڵەی خوێنی باوکی وەربگرێت.

ئەو ڕۆشتە لای ئوحەیحە کوڕی جولاح تا ئەو زرێیانە بکرێت کەپێشتر بۆی ئامادە کرابوو. ئوحەیحە وتی: نایفرۆشم و ئەگەر منالەکانی عامیر سەرکۆنەیان نەدەکردم بەتۆم دەبەخشی بەڵام لەبەرابەر وشترێکی نێری دوو ساڵە لەمنی بکرە. قەیس ئەو کارەی کرد و زرێکەی وەرگرت. پێیان دەوت (زات الحواشی). ئوحەیحە چەندین زرێی دیکەی پێ بەخشی. ئەو هاتە لای خەڵکەکەی خۆ و کاری تەیار کردن و خۆ ئامادە کردنی تەواو کرد. لەسەر ڕێگە لای ڕەبیع کوڕی زیادی عەبەسی تێپەڕی و داوای هاوکاری لێکرد تا دادی خۆی لەبکوژی باوکی وەربگرێت. ڕەبیع وەڵامی دایەوە و ڕازی بوو. کاتێك ویستی لێی جیا ببێتەوە، ڕەبیع سەیری کەل وپەلەکانی کرد وتی: چیت پێیە؟ وتی: کاڵایەك کە ئەگەر ببیبنی پێت خۆش ئەبێت. ئەو وشترەکەی خۆی خەواند و زرێی لەناو کەل و پەلەکانی دەرهێنا و نیشانی ڕەبیعی دا. ڕەبیع لای جوان بوو ، پۆشی. زرێکە ئەندازەی بوو. لەقەیسی سەند و پێی نەدایەوە. کەسەکان دەهاتن ودەچون. قەیس پێداگری دەکرد تا وەریبگرێتەوە و ڕەبیع سەرسەختی دەکرد تا نەیداتەوە. کاتێك ڕۆژگارێك بەمشێوە تێپەڕی، قەیس بنەماڵەکەی خۆی بۆمەککە نارد و بۆ وەرگرتنەوەی زرێکە ڕۆشت تا ڕەبیع بەتەنیا ببینێت.

ڕەبیع وشتر و مەڕ و ماڵاتەکەی خۆی بۆ لەوەڕگایەکی پڕ گیا برد و فەرمانی کۆچ کردنی بەبنەماڵەکەی خۆیدا. سوار ئەسپەکەی گەڕایەوە بۆ ماڵ. ئەم هەواڵە بەقەیس گەشت و لەگەڵ برا و کەسەکانی خۆی بەرێکەوت و هێرشی کردە سەر کاروانەکەی ڕەبیع و هەوساری وشتری دایکی فاتیمە کچی خەرشەب و هەوساری

وشتری ژنەکەی گرت و بەرێکەوت. دایکی رەبیع وتی: ئەی قەیس، چیت دەوێت؟ قەیس وتی: ئێوە دەبمە مەککە و لەبەرابەر زرێکەی خۆم دەتانفرۆشم. دایکی رەبیع وتی: ئێمە ئازاد بکە، پەیمان دەدەم خواستەکەت بەدی بێنم. قەیس ئەو کارەی کرد. کاتێك فاتیمە گەشتە لای رەبیع داوای لێکرد زرێکە بۆ قەیس بگەرێنێتەوە. رەبیع سوێندی خوارد کەنایگەرێنێتەوە. ژن کەسێکی بۆ لای قەیس نارد و ئەم هەواڵەی پێ گەیاند. قەیس هێرشی کردە سەر مەڕ و ماڵاتەکەی رەبیع و چوارسەد وشتری گرت و بردییە مەککە و فرۆشتی و ئەسپی چالاك و تیژپێی پێ کری. رەبیع شوێنی کەوت بەڵام پێی نەگەشتەوە. لەناو ئەسپەکانی ئەو، دوو ئەسپی گرانبایی بەناوی داحیس و غەبرا دەبینران.

دەستەیەك دەڵێن: داحیس لەئەسپەکانی مناڵەکانی یەربوعە. باوی ئەسپی پیاوێك لەمناڵەکانی زەببە بوو کەپێیان دەوت ئونەیف کوڕی جەبەبلە و ئەسپەکەیان بە(سەبت) ناو دەبرد. دایکی داحیس ئەسپی پیاوێکی یەربوعی بوو. پیاوی یەربوعی داوای لەپیاوی زەببی کرد تا ئەسپە نێرەکەی خۆی بۆ جووت گیری بۆ لای ئەو بنێرێت. ئەو رازی نەبوو. کاتێك شەو داهات، پیاوی یەربوعی رۆشتە شوێنی ئەسپەکانی پیاوی زەببی و ئەسپەکەی گرت و سواری مایینەکەی خۆی کرد. پیاوی زەببی هەستا و ئەسپەکەی خۆی نەبینی و داوای هاوکاری لەخەڵکەکەی خۆی کرد و بەهانایەوە چون. ئەو پیاوی یەربوعی گرت و بەسەرهاتەکەی بۆ خەڵکەکەی گەڕاندەوە. یەربوعی وتی: پەلە مەکەن. ئەمە بەهای تۆوی ئەسپەکەتان، وەریبگرن. خەڵك وتیان راست دەکات. پیاوێك لەم خەڵکانە پەلاماری مایینەکەی دا و دەستی بردە نا زێدانی مایینەکەی و تۆوەکەی هێنایە دەر. ئەم مایینە بێچوێکی بوو کەبەپێی ئەم داستانە بەداحیس بانگیان کرد.

پیاوی یەربوعی دوو کوڕی بوو. قەیس کوڕی زوهەیر هێرشی کردە سەر مناڵەکانی یەربوع و تاڵانی کرد و دیلی کرد. یەك لەو دوو کوڕەی بەسەر داحیسەوە بینی و ئەویتریانی بەسەر غەبرا. شوێنیان کەوت بەڵام ئەوانی بۆ نەگیرا. گەڕایەوە و دایك و دوو خوشکی ئەو کوڕانەی لەگەڵ خۆیدا برد و لەناو دیلەکانی خۆی دایدان. ئەو شەیدایی داحیس و غەبرا ببوو. ئەمە پێش کێشەی نێوان قەیس و

رەبیع هاتە ئاراوە. ئەوسا وەفدی نوێنەرایەتی منداڵەکانی یەربوع هات و بەهای ئازادی دیلەکانی دا و هەموویانی ئازاد کرد بەڵام دایك و دوو خوشکی کوڕەکەی هێشتەوە. وتی: ئەگەر ئەو دوو کوڕە ئەو بێچوە ئەسپە و ئەو ئەسپە خۆڵەمێشیە بێنن، دایك و خوشکیان تەسلیم دەکەمەوە. دوو کوڕەکە رازی نەبوون. پیاوێك لەمنداڵەکانی یەربوع کە لای قەیس دیل بوو، ئەم شێعرانەی وت و بۆ کوڕەکانی نارد:

ان مهرا فدى الرباب و جملا — و سعادا الخير مهر اناس

ادفعوا داحسا بهن سراعا — انها من فعالها الاكياس

دونها و الذى يحج له النا — س سبايا يبعن بالافراس

ان قيسا يرى الجواد من الخيـ — ـل حياة فى متلف الانفاس

يشترى الطرف بالجراجرة الجـ — ـلة يعطى عفوا بغير مكاس

واتاکەی: ئەو ئەسپانەی ببنە بەهای ئازادی سێ ژن((رەباب و جەمل و سەعاد)، باشترین ئەسپەکانی جیهان. داحیس لەبەرابەر ئەمانە بدەن چوونکە کارێکی بیرمەندانەیە. لەوانە لەپێشترن ئەو دیلانەی بەبەهای ئەسپەکان بفرۆشرێن، سوێند بەوەی خەڵك ئەرۆنە سەردانی ماڵەکەی (کەعبە)، بەمشێوەیە. قەیس لەشوێنی لەناو چوونی گیان، ئەسپی باش بەهۆکاری ژیان ئەزانێت. ئەسپە چالاك و تیژپێکان دەگرێت و بێ چەند و چون ژنانی جوان وگرانبایی دەبەخشێت.

کاتێك ئەم قسانە بەگوێی منداڵەکانی یەربوع گەشت، ئەو دوو ئەسپەیان بردە لای قەیس و ژنەکانیان ئازاد کرد.

دەستەیەك دەڵێن، قەیس داحیسی سوار مایینەکەی خۆی کرد و ئەو بێچوێکی هێنایە دنیا کەناویاننا غەبرا. قەیس لەمەککەدا مایەوە و خەڵك لەبەرابەر ئەو شانازیان بەخۆیان دەکرد. ئەو پیاوێکی لەخۆرازی و خۆپەرەست بوو. قەیس وتی: لەبارەگە وکەعبەی خۆتان چاو بپۆشن وبڵێن ئیتر چیتان هەیە. عەبدوللە کوڕی جەدعان وتی: ئەگەر لەبەرابەر ئێوە بەماڵی ئاوەدان کراوەی خواوەند و بارەگا ئەمنەکەی شانازی نەکەین، شانازی بەچیەوە بکەین؟ قەیس لەشانازی کردنی ئەوان

بێزار بوو و مەبەستی کۆچ کردنی کرد. قورەیشیەکانیش شاد بوون چوونکە ئەوانیش لەفشە کردنەکانی ئەو بێزار ببوون. قەیس بەبراکانی وت: ئێمە لەناو قورەیشیەکان ببەنەدەر و گەرنە کینەی نێوان ئێمە و ئەوان زیانی لێدەکەوێتەوە. پەیوەستی مناڵەکانی بەدر ببن کە لەنەژاد هاوتای ئێوەن و کوڕە مامی ئێمە و لەمەزنیدا بەگەورەکان هەژمار دەکرێن. بەبوونی ئەوان رەبیع ناتوانێت دەستی بەئێمە بگات. قەیس و براکانی پەیوەستی مناڵەکانی بەدر بوون و ئەو لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| اسیر الی بنی بدر بامر | هم فیها علینا بالخیار |
| فان قبلوا الجوار فخیر قوم | و ان کرهوا الجوار فغیر عار |
| اتینا الحارث الحیر بن کعب | بنجر ان و ای لجا لجار |
| فجاورنا الذین اذا اتاهم | غریب حل فی سعة القرار |
| فیامن فیهم و یکون منهم | بمنزلة الشعار من الدثار |
| و ان نفرد بحرب بنی ابینا | بلا جار فان الله جاری |

واتاکەی: بەرەو مناڵەکانی بەدر دەڕۆم و کاری خۆم بەوان دەسپێرم تا لەهەرچی بۆ ئێمەی دەکەن، ئازاد بن. ئەگەر بەپەنا بردنی ئێمە رازی بن باشترین پەنادەرەکانن و ئەگەر رازی نەبن هۆکاری شەرمن. رۆشتینە لای پیاوی چاکەکار، حارس کوڕی کەعب لەنەجران و پەنای داین. لەپەنای ئەو کەسانەدا جێگەمان گرت وەك ئەو کەسانەی کاتێك پیاوێکی نائاشنا پەنایان بۆ ببات، لەگەرمی ئارامشدا بێت. لەناو ئەواندا بەئارامی بژیت و بۆ ئەوان وەك جلی ژێرەوە لەبەرابەر جلی سەرەوەدا بێت. ئەگەر تەنیا گرفتاری شەڕی خزمەکانی خۆمان بین و پەنادەرمان نەبێت، خوا باشترین پەنای من بێت.

ئەوسا رویکردە مناڵەکانی بەدر و لەماڵی حوزەیفە دابەزی. ئەو و براکەی خەمەل کوڕی بەدر پەنایاندان و لەناو ئەواندا مایەوە. خۆی و براکانی خاوەنی چەندین ئەسپ بوون کە لەناو عەرەبەکاندا هاوتایان نەبوو. حوزەیفە هەموو

بەیانی و ئێوارەیەك دەرۆشتە لای قەیس کوڕی زوهەیر و سەیری ئەسپەکانی ئەوی دەکرد و رژدی پێدەبرد و ئەم رژدی بردنەی لەدڵدا دەشاردەوە. قەیس رۆژگارێك لەناو ئەواندا مایەوە و ئەوان، رێزیان لەخۆی و براکانی گرت. سەرئەنجام رەبیع کوڕی زیاد بێزار بوو و رەخنەی لەم رەفتارەی ئەوان گرت و کردیە هۆکاری کینە و ئەم وتانەی بەپەیامبەرێکدا بۆ ئەوان نارد:

| | |
|---|---|
| الا ابلغ بنی بدر رسولا | علی ما کان من شنأو وتر |
| بانی لم ازل لکم صدیقا | ادافع عن فزارة کل امر |
| اسالم سلمکم و ارد عنکم | فوارس اهل نجران و حجر |
| و کان ابی ابن عمکم زیاد | صفی ابیکم بدر بن عمرو |
| فالجأتم اخا الغدرات قیسا | فقد افعمتم ایغار صدری |
| فحسبی من حذیفة ضم قیس | و کان البدْ من حمل بن بدر |
| فاما ترجعوا ارجع الیکم | و ان تابووا فقد اوسعت عذری |

واتاکەی: ئەی پەیکی نامەبەر، لەگەڵ هەموو رق و کینەیەك کە لەنێوان ئێمە و منداڵەکانی بەدردا بووە، ئەم پەیامە بەوان بگەیێنە. بڵێ: بەردەوام خۆشەویستی ئێوە بووم و هەر زیانێکم لە فەزارە دوور کردۆتەوە. لەگەڵ ئاشتی خوازی ئێوە بەرێگای ئاشتیدا دەڕۆشتم و سوارانی خەڵکی نەجران و حۆجرم لەئێوە دوور دەکردەوە. باوکی من زیاد، کوڕە مامی ئێوە بوو و ئەو بەهەڵبژێردراوی باوکی ئێوە بەدر کوڕی عەمرۆ هەژمار دەکرا. ئێوە رێزتان لەنەنجامدەری هەموو فێڵەکان قەیس کوڕی زوهەیر گرت و دڵی منتان لێوانلێو لەرق و تووڕەیی کرد. لەحوزەیفە ئەوە بۆ من بەسە کەقەیسی پەیوەستی خۆی کرد، سەرەتای ئەم کارە لەحەمەل کوڕی بەدر بوو. ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای ئێوە دەگەڕێمەوە و ئەگەر خۆتان دوور بخەنەوە ئاگادار بن کەمن ئاگاداری پێویستم داوە و لەپێشەوە زۆر داوای لێبوردنم کردووە و رێگەم بۆ هیچ بیانوێك نەهێشتۆتەوە.

ئەوان لەپەنادان بەقەیس پەشیمان نەبوونەوە و رەفتاری خۆیان نەگۆڕی. رەبیع تووڕە و منداڵەکانی عەبەس بەهۆی تووڕە بوونی ئەو تووڕەتر. ئەوسا حوزەیفە لەقەیس بێزار و ویستی دەری بکات بەلاَم بیانوی دەست نەکەوت. قەیس مەبەستی عەمرەی کرد و بەهاوەلاَنی خۆی وت: مەبەستی عەمرەم لەسەردایە بەلاَم ئاگادارتان دەکەم نەکا بەهیچ بیانوێك لەگەڵ حوزەیفە دەرگیر ببن چوونکە زیانم لەروخساری ئەودا بینیوە. بەهەر کارێك لەکارەکانی ئەو بەخۆڕراگرییەوە رازی ببن تا دەگەرێمەوە لاتان. ئەو ناتوانێت ڕقی خۆی لەئێوە بستێنێت و بیانوی دەست کەوێت مەگەر ئەوەی لەسەر کێبڕکێ ئەسپ سواری گرێوی لەگەڵ بکەن. هەرکات قەیس پێشبینی شتێکی دەکرد، تووشی هەڵە نەدەبوو. ئەو ڕۆشتە مەککە. لەم کاتەدا گەنجێك بەناوی وەرد کوڕی مالیك هاتە لای حوزەیفە و لای ئەو دانیشت. وەرد بەحوزەیفەی وت: چەند باش ئەبێت ئەسپێکی نێر لەئەسپەکانی قەیس هەڵگریت تاببێتە هۆی ئاوس بوونی ماینەکەی تۆ و بنچینەی ئەسپە ڕەسەنەکانی عەرەب بۆ تۆبن. حوزەیفە وتی: ئەسپەکانی من باشتر لەئەسپەکانی قەیسن. هەردوك لەسەر وتەکەی خۆیان پێداگریان کرد تا ئەوەی لەسەر دوو ئەسپ لەئەسپەکانی قەیس و دوو ئەسپ لەئەسپەکانی حوزەیفە گرێویان کرد. بەهای کێبڕکێ کەیان بە دە (زود) دیاری کرد.

وەرد بەرەو مەککە بەرێکەوت و هاتە لای قەیس و ئاگاداری کردەوە. قەیس وتی: دەبینم ئێمەت لەگەڵ منداڵەکانی بەدردا توشی گێژاو کرد و خۆت لەگەڵ من کەوتیتە هەڵدێری گێژاوەوە. حوزەیفە پیاوێکی ستەمکارە کەبەحەق بەسەندە ناکات و ئێمە بەبێدادی ئەو رازی نابین. قەیس لەعەمرە گەڕایەوە و خەڵکەکەی کۆکردەوە. ئەوان سوار ئەسپ بوون و ڕۆشتنە لای حوزەیفە. قەیس داوای لەحوزەیفە کرد گرێوەکە هەڵبووەشێنێتەوە. ئەو رازی نەبوو. دەستەیە لەخەڵکانی عەبەس و فەزارە داوایان لێکرد هەڵیبوەشێنێتەوە، بەلاَم نەیکرد. حوزەیفە وتی: ئەگەر ئێستا قەیس رازی بێت کەئەسپەکانی من چالاکتر لەئەسپەکانی ئەوەن و ئەو گرێوەکەی بەمن دۆڕاندووە، رازی دەبم و گەرنە تا کۆتایی گرێوەکە دەڕۆم. باوکی جەعدە فەزاری وتی:

| | |
|---|---|
| ال بدر دعو الرهان فانا | قد مللنا اللجاج عند السباق |
| و دعوا المرْ فی فزارة جارا | ان ما غاب عنكم كالعيان |
| ليت شعری عن هاشم و حصين | و ابن عوف و حارث و سنان |
| خين ياتيهم لجاجك قيسا | رأی صاح اتيت ام نشوان |

واتاكەی: ئەوەی بەدرییەكان، واز لەگرێو كردن بێنن كەئێمە لەپێداگرتن و سەرسەختی لەسەر گرێو بێزار بووین و هیلاك. رێگە بەم پیاوە بدەن پەنابەری فەزارە بێت. ئەوەی لەچاوی ئێوە شاراوەیە، وەك خۆر ئاشكرایە. خۆزگە دەمزانی كاتێك هاشم و حەسی و كوڕی عەوف و سنان و حارس ئەم داستانە ببیستن و سەختگیری تۆ لەسەر قەیس بزانن، بڵێن باوەڕی پیاوێكی وشیارت دەربڕیوە یا هاوشێوەی مەستەكان قسەت كردووە.

براكان وسەروەرانی خەڵكی حوزەیفە داواین لێكرد گرێوەكە هەڵوەشێنێتەوە و ئەو سەرسەختی كرد. قەیس وتی: لەسەرچی لەگەڵ من گرێو دەكەیت؟ حوزەیفە وتی: لەسەر دوو ئەسپەكەی تۆ داحیس و غەبرا و لەسەر دوو ئەسپەكەی من خەتار و حەنفا. دەستەیەك دەڵێن: گرێو لەسەر دوو ئەسپەكە داحیس و غەبرا بوو. قەیس وتی: داحیس چالاكترە. حوزەیفە وتی: غەبرا چالاكترە. بەقەیسی وت: ئەمەوێت ئاگادارت بكەمەوە كەچاوی من سەبارەت بەئەسپەكان تیژتر و وردبینتر لەچاوی تۆیە. وتاری یەكەم راست ترە. قەیس پێی وت: ماوە و شوێن دیاری بكە و گرێوەكەت ببەسەر. حوزەیفە وتی: ئەوە بێت لە(ئۆبلی) تا (زات ئەلساد) بەغاردان بڕۆین كەبەرابەرە لەگەڵ هاویشتنی سەد و بیست تیر. گرێو ئەوە بێت دۆڕاو سەد وشتر بدات. ئەوان ئەسپەكانیان لاغر و دەستەمۆ كرد. ئەسپەكانیان رازاندەوە و زینیان كرد و كاتێك لەم كارە تەواو بوون، ڕۆشتنە شوێنی تایبەت و كۆبوونەوە و جل و بەرگی ئەسپ سواریان لەبەر كرد و مەرجی گرێوەكەیان (سەد وشتر) دایە دەست عیقال كوڕی مەروان كوڕی حەكەمی قەیسی و چەندین كەسیان وەك ئەمین بەتاودانی ئەسپەكان دیاری كرد تا داوەری بكەن.

حوزەیفە پیاوێكی لەمناڵەكانی ئەسەد لەسەر رێگا دانیشاند و فەرمانی پێدا

ئەگەر داحیس پێشی کەوت لەزات ئەساد بیگرێت و بۆ کۆتایی دۆڵەکەی هەڵبدات.

کاتێك ئەسپەکان بەرێکەوتن و غاردانیان دەست پێکرد، داحیس بەشێوەیەکی ئاشکرا پێش کەوت و خەڵك سەیریان دەکرد و قەیس و حوزەیفە لەگەڵ خەڵکانی خۆیان لەشوێنەکەدا وەستابوون. کاتێك داحیس بەرەو خواروی دۆڵەکە ڕۆشت، پیاوی ئەسەددی قامچی لەسەری ئەسپەکەدا و خستیە ناو ئاو. نزیك بوو ئەو و سوارکار هەردووك لەناو ئاودا بخنکێن. کاتێك هاتنەدەر، ئەسپەکان پێشیان کەوتبوون ودوور کەوتبوونەوە. سوارکاری غەبرا کاتێك درەنگ کردنی داحیسی بینی، ڕێگەی گۆڕی و لەرێگەی داحیسەوە نەڕۆشت، ڕێگەی خوار کرد و دواتر هاتە سەر ڕێگا و هاوشانی ئەسپەکانی حوزەیفە غاریدا.

لەم کاتەدا حەفنا دواکەوت و غەبرا و خەتار بەجێمان و بەردەوام بوون لەڕۆشتن. کاتێك ئەم دوو ئەسپە گەشتنە زەمینێکی نارێك، خەتار پێش دەکەوت و کاتێك دەگەشتنە زەوینێکی ڕێك و تەخت، غەبرا پێش دەکەوت. کاتێك نزیك بوونەوە و لێرەدا گەشتنە زەوینێکی نارێك، حوزەیفە وتی: ئەی قەیس، ئەسپەکەی من لەئەسپەکەی تۆ پێش کەوت. قەیس وتی: کەمێك ئارام بە، پیاوی بەشانس براوە بێت. ئەم وتەیە بوو بەپەند. کاتێك گەشتنە زەوینێکی ڕێك ( و غەبرا پێش کەوت)، حوزەیفە وتی: سوێند بەخوا ئەم پیاوە فێڵی لێکردین. قەیس وتی: ئەو کەسەی سەد و بیست مەودای تیر غاربدات، فێڵ ناکات. ئەم وتەیە بوو بەپەند. ئەوسا غەبرا پێشتر لەهەمووان گەشت و بەدوای ئەو خەتار و دواتر حەفنا کەئەسپەکانی حوزەیفە بوون، دەرکەوتن. دواتر داحیس بەئارامی هات. سوارکارەکەی جڵەوەکەی گرتبوو.. کوڕی سوارکار (یا کۆیلەی سوارکار) بەقەیسی وت کەچییان لەئەسپەکەی کرد. حوزەیفە وتی: درۆیە. ئەو بێدادگەرانە خوازیاری وەرگرتنی (سەد وشترەکە)بوو و وتی گرێوەکەی بردۆتەوە. حوزەیفە وتی: دوو ئەسپەکەی من بەردەوام دەهاتن. قەیس و هاورێکانی دەڕۆشتنە شوێنێك کەداویان بۆ داحیس دانابوو. ئەو کەسانەیان بینی داحسیان گرتبوو. بابەتەکە ئاڵۆز بوو.

هەواڵی ئەم ئاڵۆزییە بەرەبیع کوڕی زیاد گەشت و شادمانی خۆی دەربڕی. بەهاورێکانی خۆی وت: سوێند بەخوا قەیس کەوتە لێواری هەڵدێری لەناوچوون.

ئەزانم ئەگەرحوزەیفە ئەو نەکوژێت، دێتە لای ئێوە و پەناتان بۆ دەبات. سوێند بەخوا ئەگەر ئەم کارە بکات ناچار دەبێت وەریبگرن.

دواتر ئەو پیاوە ئەسەدییە لەگرتنی داحیس پەشیمان بوویەوە و ڕۆشتە لای قەیس و بێزاری خۆی لەگوناحەکەی دەربڕی. حوزەیفە جنێوی پێدا.

دوای ئەمە منالەکانی بەدر لەرێزگرتنی قەیس و براکانی کەمتەرخەمیان کرد و بەردەوام تانەیان لێدەدان. قەیس ئەوانی سەرکۆنە کرد و ئەوان ستەم و ئازاریان زیاد دەکرد.

لەم ناوەدا قەیس و حوزەیفە سەبارەت بەگرێو و هۆکاری گرێو (سەد وشتر) رێککەوتن بەشێوەیەك کەویستیان بەزۆر بەهای گرێوەکە وەربگرن. خەڵك رێگەیان لێگرتن و زۆرداری و ستەمکاری حوزەیفە بۆ ئەوان ئاشکرا بوو. حوزەیفە لەوەرگرتنی سەد وشترەکە پێداگری دەکرد و کوڕەکەی نەدبەی ناردە لای قەیس و خوازیاری وشترەکان بوو. قەیس بەشمشێر لێیدا و کوشتی و ئەسپەکەی بەتەنیا بۆ لای باوکی گەڕایەوە. قەیس هاواری کرد: ئەی منالەکانی عەبەس، تێبکۆشن و هەرچی زووتر کۆچ بکەن. هەموویان سوار بوون. کاتێك ئەسپەکە گەشتە لای حوزەیفە زانی کوڕەکەی کوژراوە. لەناو خەڵکەکەی جاریدا و هاوەڵەکانی سوار بوون و بەرەوماڵەکانی منالەکانی عەبەس بەرێکەوتن بەلام بەچۆڵیان بینی. حوزەیفە کوڕەکەی بەکوژراو بینی و نێوان دووچاوی ماچ کرد. خەڵك ئەویان بەخاك سپارد.

مالیك کوڕی زوهەیر هاوسەرێکی لەمنالەکانی فەزارە بوو ولەناو ئەواندا دەژیا. قەیس پەیامی بۆنارد: من نەدبە کوڕی حوزەیفەم کوشت و کۆچم کرد. خۆت بەمن بگەیێنە وەگەرنە دەکوژرێیت. وتی: قەیس ستەمی لەو کردووە، گوناحی من نییە. ئەو کۆچی نەکرد. قەیس کەسێکی بۆ لای رەبیع کوڕی زیاد نارد و داوای کرد بڕواتە لای و لای ئەو بمێنێتەوە چوونکە هەردووکیان لەخزمان و کەسەکانی یەك بوون. رەبیع رازی نەبوو و نەبووە پشتیوانی. ئەو لەمبارەوە بیرمەند بوو.

دواتر منالەکانی بەدر مالیك کوڕی زوهەیر برای قەیسیان کوشت کە لەناو ئەواندا مابوویەوە. هەواڵی کوژرانی ئەو بەمنالەکانی عەبەس و رەبیع کوڕی زیاد گەشت و ئەم کارەیان پێ ناخۆش بوو. رەبیع کەسێکی بەنهێنی بۆ لای قەیس نارد تا

ئاگاداری کاروبارەکانی بێت و هەواڵی بۆ بێنێت. ئەو کەسە هات و قەیسی بینی شێعر دەهۆنێتەوە و دەگریت:

اینجو بنو بدر بمقتل مالك — و يخذ لنافى النائبات ربيع
و كان زياد قبله يتقى به — من الدهر ان يوم الم فظيع
فقل لربيع يحتذى فعل شيخه — و ما الناس الا حافظ و مضيع
و الا فمالى فى البلاد اقامة — و امر بنى بدر على جميع

واتاکەی: ئایا منداڵەکانی بەدر مالیك دەکوژن و رزگاریان دەبێت؟ ئایا رەبیع نێمە لەبەردەم ئەم پێشهاتە گیان برانە بەتەنیا جێ دێڵێت؟ پێش ئەو باوکی بەشێوەیەك بوو خەڵك پەنایان بۆ دەبرد و ئارامیان دەگرت و ئەگەرکێشەیەکی دژوار دەهاتە پێش، لەزیانی رۆژگار لەئەماندا دەبوون. بەرەبیع بڵێ رێچکەی پیرەکەی خۆی بگرێتە بەر چوونکە خەڵك دوو دەستە زیاتر نین: یا پەنادەری لێ قەوماوان یا لەناوبەری ئەوان. وەگەرنە من لەناو سەرزەمینەکان رێگەیەکم نییە چوونکە بەدرییەکان بۆ رشتنی خوێنی من هاوبەڵێنن.

کەسەکە بۆ لای رەبیع گەڕایەوە و ئاگاداری کردەوە. رەبیع بۆ مالیك گریا و وتی:

منع الرقاد فما اغمض ساعة — جزعا من الخبر العظيم السارى
افبعد مقتل مالك بن زهير — يرجو النسأ عواقب الاطهار
من كان مسرورا بمقتل مالك — فليات نسوتنا بووجه نهار
يجد النسأ حواسرا يندبنه — و يقمن قبل تبلج الاسحار
يضربن حر وجوهن على فتى — ضخم الدسيعة غير ما خوار
قد كن يكن الوجوه تسترا — فاليوم حين برزن للنظار

واتاکەی: خەو لەچاوی من کۆچی کرد و لەبیستنی ئەو هەواڵە سەخت و گران و باو لەناو خەڵکە، ناتوانم بۆ ساتێکیش چاوەکانم لێك نێم. ئایا ژنان دوای کوژرانی

مالیك كوڕی زوهەیر هیوای ژیانێكی پاك و ئارامیان هەیە؟ هەر كەس لەكوژرانی زوهەیر شاد بێت، دەبێت لەكاتی روناكی رۆژ بێتە لای ژنەكانی ئێمە. ژنان ببینێت كەسەر و روخساریان روت كردووە و بۆی دەگرین و پێش هەلآتنی خۆر هەڵدەستن چوونكە خەویان پەرێشان پچڕپچڕە. بۆ گەنجێك شەقەزللە لەروخسار دەدەن كە لەكاتی میوانداری، قازانە گەورەكانی لەسەر زەوی دادەنا و دەنگی خۆی بەرز نەدەكردەوە. ژنانی ئێمە لەرێگەی داپۆشینەوە روخساری خۆیان دەشاردەوە بەلآم ئێستا بۆ بینەران ئاشكرا بوون.

ئەمە قەسیدەیەكی دوور و درێژە.

قەیس ئەم قەسیدەی بیست. لەگەڵ كەسەكانی سوار بوون و هاتنە لای زیاد كوڕی رەبیع و ئەویان بینی كەل و پەلی شەڕی خۆی دروست دەكات. قەیس هات و رەبیع هەستا. ئەو دووانە یەكیان لەئامێز گرت و گریان و بۆ كوژرانی مالیك شینیان كرد. خەڵك یەكیان بینی و دابەزین. دواتر قەیس بەرەبیعی وت: ئەوەی بۆ تۆ پەنا بێنێت ناتوانێت لەتۆ رابكات و ئەوەی داوای هاوكاری لەتۆ بكات بێ وەلآم نابێت. خراپترین رۆژم لەگەڵ تۆدا بوو، بەلآم تۆ باشترین رۆژت لەگەڵ من دەبێت. چاوی هیوام لەخەڵكەكەی خۆمە و تۆ چاوی هیوات لەخەڵكەكەی خۆت. ئەوان مالكیان كوشتووە. مەبەستی ئەنجامدانی كارێكی هەڵەم نییە چوونكە ئەگەر بڕۆمە شەڕی مناڵەكانی بەدر، مناڵەكانی زەبیان یارمەتیان دەدەن و ئەگەر ئەوان بێنە شەڕی من، مناڵەكانی عەبەس دەست لەهاوكاری كردنی من هەڵدەگرن مەگەر ئەوەی تۆ ئەوان لەدەوری من كۆبكەیتەوە. من و ئەوان لەخوێنرێژی بەرابەرین. من كوڕەكەیانم كوشت و ئەوان براكەم. ئەگەر هاوكاریم بكەیت چاوی تەماح دەبڕمە ئەوان و ئەگەر هاوكاریم نەكەیت ئەوان چاوی تەماح دەبڕنە من. رەبیع وتی: ئەی قەیس، هەنوكە لەبەرژوەندی مندا نییە بۆ تۆ ئەو گەورەییەم بووێت كەبۆ خۆم نامەوێت و لەبەرژەوەندی تۆدانییە بۆ من ئەوەت بووێت كە بۆتۆ نامەوێت. كوژرانی مالیك لای من گران و قورساییەكەی كەوتۆتە سەرشانی من و تۆ ستەمكار و ستەم لێكراویت. بۆ ئەسپەكانت ستەمیان لەتۆ كرد و تۆ بەخوێن ڕشتن ستەمت لەوان كرد. ئەوان

براکەی تۆیان لەبەرابەر کوڕەکەیان کوشتەوە. ئەگەر خوێن، خوێن بێنێت و ئاگری شەڕ کلپە بسێنێت، لەگەڵ تۆ دەبم. من خوازیاری دوو کارم: لەگەڵ منداڵەکانی بەدر ئاشتی بکەیت و شەڕ لەگەڵ هوازین بکەین. قەیس پەیکی بۆ لای کەسان و براکانی خۆی نارد کە هاتن و لای رەبیع مانەوە. عەنتەرە کوڕی شەداد ئەم شێعرەی لەپرسەی مالیکدا هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| فلله عينا من راى مثل مالك | عقيرة قوم ان جرى فرسان |
| فليتهمالم يطعما الدهر بعدها | و ليتهما لم يجمعا لرهان |
| و ليتهما ماتا جميعا ببلدة | و اخطاهما قيس فلا يريان |
| لقد جلبا جلبا لمصرع مالك | و كان كريما ماجدها لهجان |
| و كان اذا ما كان يوم كريهة | فقد علموا انى و هو فتيان |
| و كنا لدى الهيجأ نحمى نسائنا | و نضرب عند الكرب كل بنان |
| فسوف ترى ان كنت بعدك باقيا | و امكننى دهرى و طول زمانى |
| فاقسم حقا لو بقيت لنظرة | لقرت بها عيناك حين ترابى |

واتاکەی: خۆزگە بەو چاوەی جوامێرێکی هاوتای مالیکی بینیبێت. کوژراوی خەڵکێکە لەسەر غاردانی دوو ئەسپ گرێویان کرد. خۆزگە ئەو دوو ئەسپە لەدوای ئەوە هیچ خواردنێکیان لەجیهان نەدەخوارد و خۆزگە بۆ گرێو بەستن کۆنەدەبوونەوە. خۆزگە هەردووک لەسەرزەمینێك مردبوون و قەیس ئەو دووانەی لەدەست ئەدا و ئەو دوانە هەرگیز نەدەبینران. بەکوژرانی مالیك دەردێکی گەورەیان بەدیهێنا و زیانێکی گەورەیان بەجێهێشت. کەسێکی گەورە و بەشکۆ و بەخشەر بوو، ئەویان کوشت. کاتێك لەشەڕ، رۆژێکی سەخت دەهاتە پێش، هەمووان دەیانزانی من و ئەو دوو جوامێری لێهاتووین. لەکاتی شەڕ پاسەوانی ژنەکانی خۆمانمان دەکرد و لەکاتی دژواری هەموو پەنجەکانی دوژمنمان دەبڕیەوە. بەزویی دەبینیت ئەگەر لەدوای تۆ پایەدار بم و رۆژگار ودرێژی زەمان دەرفەت بەمن بدات، بەراستی سوێند دەخۆم کەئەگەر یەك چاو تروکاندن زیندوو بم، لەهەمان زەمانە کورتەدا ئەو کارە دەکەم کەچاوەکانی تۆ روون ببنەوە.

حوزەیفە گەشت لەهاوپەیمانی رەبیع و قەیس ئاگادار بوویەوە. ئەم کارە لای ئەو گران و خۆی بۆ کارێکی دژوار ئامادە کرد. دەستەیەك دەڵێن سەرزەمینی عەبەس گیرۆدەی وشکەساڵی بوو و خەڵکەکەی بۆ ئاو و گیا ڕۆشتنە سەرزەمینی فەزارە. رەبیع هاوسێیەتی حوزەیفەی هەڵبژارد و لای ئەو مایەوە. کاتێك هەواڵی کوژرانی مالیك بەرەبیع گەشت، بەحوزەیفەی وت: بۆ کارێك، سێ رۆژ دێمە لای تۆ و دواتر دەڕۆم. حوزەیفە رازی بوو. رەبیع کوڕی زیاد ڕۆشتە لای منداڵەکانی فەزارە. ئەم هەواڵە گەشتە گوێی حەمل کوڕی بەدر برای حوزەیفە. بەبراکەی وت: بۆچوونێکی خراپ بوو پێی رازی بوویت و کارێکی خراپ بوو ئەنجامت دا. مالیکت کوشت و رەبیعت رەها کرد. سوێند بەخوا بێ گومان جیهان لەتۆ تەنگ دەکات و ئاگرێکی گەورە پێ دەکات و تۆ لەناویدا دەسوتێنێت. هەردووك بەدوایدا ڕۆشتن بەڵام نەیاندۆزیەوە. دڵنیابوون لەوەی مەبەستی کارێکی زیانباری لەسەردا پەروەردە کردووە.

رەبیع و قەیس هاوپەیمان بوون و حوزەیفە لەگەڵ خەڵکەکەی بۆ شەڕ لەگەڵ عەبەسییەکان پەیمانیان بەست. رەبیع و قەیس، خەڵکەکەی خۆیان کۆکردەوە و ئامادەی شەڕ بوون. منداڵەکانی فەزارە هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی عەبەس و تاڵانی و کوشتاریان کرد و دیلیان گرت. عەبەسییەکان پەرێشان بوون و بۆ هێرش کردن کۆبوونەوە. منداڵەکانی فەزارە لەم کارە ئاگادار بوونەوە. روبەرویان بوونەوە و لەشوێنێك بەناوی (عەزەق) چاویان بەیەك کەوت وئەمە یەکەم چاوپێکەوتن و یەکەم شەڕیان بوو. شەڕێکی سەختیان کرد. عەوف کوڕی یەزید لەسەر دەستی جوندەبی کوڕی خەلەف عەبەسی کوژرا. منداڵەکانی فەزارە شکستیان خوارد و بەسەختی کوشتار کران. رەبیع کوڕی زیاد، حوزەیفە کوڕی بەدری بەدلیلی گرت. حوڕ کوڕی حارسی عەبەسی سوێندی خواردبوو ئەگەر حوزەیفەی بەردەست کەوێت بەشمشێر بیکوژێت. ئەو شمشێرێکی تیژی بەناوی (ئەسرەم) بوو. ویستی حوزەیفە بەو شمشێرە بکوژێت چوونکە دەیویست سوێندەکەی بەجێبێنێت. رەبیع کەسێکی بۆلای ژنەکەی نارد تا شمشێرەکەی دابشارێت. ئەویان لەکوشتنی حوزەیفە ترساند و رێگەیان لێگرت و وتیان دواهاتێکی خراپی بەدواوە دەبێت. پێداگری کرد حوزەیفە بەشمشێر بکوژێت. پیاوانێکیان بۆ پاسەوانی کردنی ئەودانا بەڵام ئەو بەشمشێر

لەحوزەیفەی دا. شمشێرەکە کاریگەری دانەنا و حوزیفە بەئەسیری مایەوە .

خەڵکی غەامفان کۆبوونەوە و بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی هەوڵیاندا. لەسەر ئەم بنەمایە ئاشتیان کرد کەخوێنی بەدر کوڕی حوزەیفە بەخوێنی مالیك کوڕی زوهەیر بەرابەر و هاوتا بکەن و بۆ عەوف کوڕی بەدر خوێنبایی بدەن و لەبەرابەر ئەو زەربەی حارسی عەبەسی لەحوزەیفەی دا، دوو سەد وشتری بەحوزەیفە بدەن بەو مەرجەی وشترەکان هەموویان مێچکەی سکپڕ بن و چواردە کۆیلەیان خستەسەر. حوزەیفە خوێنی کوژراوەکانی منالەکانی فەزارەی بەخشی و لەئەسیری رزگاری بوو.

کاتێك حوزەیفە هاتە لای خەڵکەکەی خۆی، لەکردەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و وقسەی ناشیرینی سەبارەت بەمنالەکانی عەبەس هێنایە سەرزمان. زوهەیر کوڕی قەیس و منالەکانی عەمارە کوڕی زیاد سوار بوون و ڕۆشتنە لای حوزەیفە و گفتوگۆیان لەگەڵ کرد. وەلامی ئەوانی دایەوە و بە قسەکانیان رازی بوو، رازی بەوەی وشترەکانیان بداتەوە. وشترەکان لای ئەو زابوون. لەم گفتوگۆیەدا بوون کەسەنان کوڕی ئەبی حارسە موڕی گەشت و ڕێگە چارەی حوزەیفەی بۆ ئاشتی بەقێزەون لە قەڵەم دا و وتی: ئەگەر ناچاری بەدانی وشترەکان، وشتری لاغر لەجیاتی وشترە قەڵەوەکان بەوان بدە و بێچوە وشترەکان لای خۆت بهێڵەرەوە. ئەم وتەیە لەگەڵ مەبەستی ناخی حوزەیفەدا یەکی گرتەوە بەلام قەیس و عەمارە رازی نەبوون.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو وشترانەی لەویان وەرگرت، وشترانێك بوون پێشتر لەقەیسی وەرگرتبوو. هەروەها دەڵێن: مالیك کوڕی زوهەیر پێش روداوەکەی پێش کوژرابوو. حومەید کوڕی بەدر لەمبارەوە وتی:

قتلنا بعوف مالکا و هو ثارنا      و من یبتدع شیئا سوی الحق یطلم

واتاکەی: ئێمە لەبەرابەر مالیك سەرقاڵی کوشتنی عەوف بووین کەخوێنبایی ئێمە بوو و هەر کەس جگە لەراستی و دروستی کارێك دەست پێ بکات، ستەم دەبینێت و گەمەکە دەدۆڕێنێت.

سەنان بەئامادە بوونی هاوەڵانیان سەبارەت بەشەڕ لەگەڵ حوزەیفە قسەی کرد. ئەوسا ئەنسار لەمەبەستی ئەوان ئاگادار بوونەوە. دواتر دەستەیەك لەگەورەکانیان پەیمانیان بەست. ئەوم کەسانە لەناویاناندا دەبینران:

عەمرۆ کوڕی ئیتنابە، مالیك کوڕی عەجلان، ئۆحەیحە کوڕی جولاح، قەیس کوڕی خەتیم و... ئەوان بەرێکەوتن تا بۆ ئاشتی هەوڵ بدەن. گەشتنە لای خەڵکەکەی حوزەیفە و سەبارەت بەسازان گفتوگۆ و هاتوچۆیان کرد بەڵام حوزەیفە رازی نەبوو و ستەمکاری خۆی نیشاندا. ئەوان لەدواهاتی خراپەکارییەکانی ئاگاداریان کردەوە و گەڕانەوە.

حوزەیفە هێرشی کردە سەر منداڵەکانی عەبەس و منداڵەکانی عەبەس بۆ سەر فەزارە. زیانەکان روی لەزیاد بوون کرد. حوزەیفە براکەی حەملی نارد و هێرشی کرد و ریان کوڕی ئەسلەع کوڕی سوفیانی ئەسیر کرد و بەتوندی بەستییەوە و هێنایە لای حوزەیفە. حوزەیفە ئازادی کرد تا دوو کوڕەکەی خۆی هاوڕێ لەگەڵ کوڕی براکەی عەمرۆ کوڕی ئەسلەع وەك بارمتە دابنێت. ریان ئەو کارەی کرد. دواتر قەیس بەرێکەوت و روبەروی دەستەیەك لەوان بوویەوە کەمالیك کوڕی بەدر لەناو ئەواندا دەبینران. ئەوی کوشت و منداڵەکانی فەزارە شکستیان خوارد. لەم کاتەدا حوزەیفە رویکردە دوو کوڕەکەی ریان و ئەوانی کوشت. ئەوان تا کاتی گیاندان هاواریان دەکرد: (ئای باوە گیان). ویستی کوڕی براکەیشی بکوژێت بەڵام خاڵەکانی نەیانهێشت.

کاتێك مالیك و ئەو دوو کوڕە کوژران، شەڕی نێوان ئەم دوو دەستە پەرەی سەند و کوژراوەکان زیاتر لەفەزارەیان و هاوەڵەکانیان بوون. چەند رۆژ شەڕ و کوشتاریان کرد و بەسەختی هەوڵیاندا و شەڕ تا دوایین رۆژ درێژەی کێشا. ریان کوڕی ئەسلەع، زەید کوڕی حوزەیفە بینی. هێرشی کردە سەری و خوێنی رشت. زوبیان و فەزارە شکستیان خوارد. حارس کوڕی بەدریان گرت و کوشتیان. کاتێك زیاد و حارس کوژران، حوزەیفە هەموو منداڵەکانی زوبیانی کۆکردەوە و کەسێکی بۆ لای ئەشجەع و ئەسەد کوڕی خەزیمە نارد و ئەوانی کۆکردەوە. ئەم هەواڵە گەشتە منداڵەکانی عەبەس و ئەوانیش کەسەکانی خۆیان کۆکردەوە. قەیس کوڕی زوهەیر وتی: پێش

لەوان دەبێت خۆیان بەناوی عەقیقە (عەفیفە) بگەیێنن. ئەم کارمیان کرد. حوزەیفە لەگەڵ دارودەستەکەی خۆی بەرەو لای عەبەسیەکان غاریدا. ناوبژیوانان لەم ناوەدا هاتوچۆیان دەکرد. حوزەیفە سوێندی خوارد تا لەئاوی عەقیقە نەخواتەوە، ئاشتی ناکات. قەیس مەشکەیەکی لەو ئاوە پڕ کرد وبۆی نارد و وتی: ڕێگە نادەم حوزەیفە فێڵم لێبکات. لەسەر ئەم بنەمایە ئاشتیان کرد کەمناڵەکانی عەبەس بەهای خوێنی کوژراوەکانی حوزەیفە بدان. بارمتەیان لای ئەو دانا تا خوێنباییەکان کۆبکەنەوە. ژمارەیان بە دە، دەگەشت. یەکێك لەبارمتەکان کوڕێك لەکوڕەکانی زوهەیر بوو و ئەویتریان کوڕی ڕەبیع کوڕی زیاد. یەك لەم دوانەیان بەقوتبە کوڕی سەنان سپاردبوو و ئەویتریان بەپیاوێکی کوێر لەبەکر کوڕی وایل. دەستەیەك لەخەڵك سەرکۆنەی حوزەیفەیان کرد کە بۆ خوێنبایی وەرگرتووە. ئەو و براکەی حەمل ڕۆشتنە لای قوتبە کوڕی سەنان و ئەو کوێرە بەکرییە و وتیان: دوو کوڕەکە بەئێمە بسپێرن تا پۆشتەیان بکەینەوە و بیاننێرینەوە. قوتبە کوڕەکەی پێ سپاردن بەڵام کوێرە بەکرییەکەی رادەست نەکردنەوە. ئەوەی لای قوتبە بوو، کوڕی قەیس بوو. کاتێك کوڕەکەی قەیسیان وەرگرت، گەڕانەوە و لەڕێگادا یەکێك لەکوڕەکانی عومارە کوڕی زیادی عەبەسیان لەگەڵ کوڕە مامەکەی بینی. ئەو دوانەیان گرت و هاورێ لەگەڵ قەیس هەر سێکیان کوشت.

کاتێك ئەم هەواڵە بەمناڵەکانی عەبەس گەشت، ئەو خوێنباییانەی وەریانگرتبوو (زیاتر وشتر بوو)، کۆکردەوە و خەڵکانیان سوار کرد و کەرستەی شەڕیان کڕی. دواتر قەیس لەگەڵ دەستەیەك هاتەدەر. ئەوان یەکێك لەکوڕەکانی حوزەیفەیان لەگەڵ چەندین سوار لەمناڵەکانی زوبیان بینی و ئەوانیان کوشتار کرد. حوزەیفە کەسەکانی خۆی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر عەبەسیەکان. ئەوان لەسەر ئاوێك بەناوی عەراعەر بوون. لەوێ شەڕیان کرد و سەرکەوتن بەفەزاریەکان بڕا و تەندروست بۆ ماڵەوە گەڕانەوە. حوزەیفە لەشەڕ پێداگری دەکرد و براکەی نەیاری شەڕ و لەوەی رویدابوو، پەشیمانی خۆی دەربڕی. پێشنیاری ئاشتی بەبراکەی دا، بەڵام حوزەیفە رازی نەبوو. ئەو چەندین دەستەی لەئەسەد و زوبیان و تیرەکانی دیکەی غەتەفان کۆکردەوە و روی کردە مناڵەکانی عەبەس. مناڵەکانی عەبەس

کۆبوونەوە و راوێژیان کرد. قەیس کوڕی زوهەیر بەوانی وت: ئێستا لەشکرێك هێرش دەکاتە سەر ئێوە کەتوانای خۆراگری لەبەردەم ئەوانتان نییە. منداڵەکانی بەدر جگە لەخوێنی ئێوەیان ناوێت و خوازیاری زیادەڕۆیی لەسەر ئێوەن. کەسانیتر جگە لەتالانی خوازیاری هیچیتر نین. باوەڕی من وایە سامانەکانمان لەشوێنی خۆمان بەجێبێڵین و لێرە دوو سوار دابنێین کەیەکیان سوار لەسەر داحیس بێت و ئەویتر سوار لەسەر ئەسپێکی چالاك. ئێمە دەڕۆین و لەدوورییەکی نزیك لەسامانەکان بۆسە دەنێینەوە. کاتێك ئەم خەڵکە هاتنە لای سامانەکانی ئێوە، دوو سوارەکە بەغاردان بێنە لای ئێمە و ئێمە لەهاتنی ئەوان ئاگادار بکەنەوە. خەڵك بەتالان کردنی هەرچی زیاتری سامانەکان سەرقاڵ دەبن و ئەگەر بیرمەندەکانی ئەوان رێگەی ئەم کارەیان لێبگرن، خەڵکانی دیکە رازی نابن و نافەرمانی دەکەن. ئامادەیی ئەوان لێك دەپچڕێت و هەر کەس سەرقاڵی پاسەوانی کردن لەسامانە تالانییەکانی خۆی دەبێت. ئەوان کەرەستەکانی شەڕی خۆیان دەخەنە پشت وشترەکان و لەئەماندا دەبن. کاتێك دوو سوارەکە ئێمەیان ئاگادار کردەوە، دەگەڕێینەوە و لەو حاڵەدا گەمارۆ دەدەین. لەم کاتەدا هەر کەس لەبیری رزگاری خۆیدا دەبێت و کەس یارمەتی ئەوی دیکە نادات.

ئەو کارەیان کرد و حوزەیفە و کەسەکانی گەشتن و سەرقاڵی تالان کردن بوون. حوزەیفە و کەسانیتر رێگەی ئەم کارەیان لێگرتن بەڵام خەڵك گوێیان لێ نەگرتن. کارەکە بەوشێوە قەیس پێشبینی کردبوو، دەڕۆشتە پێش. منداڵەکانی عەبەس گەڕانەوە و بینیان منداڵەکانی ئەسەد و کەسانیتر بڵاوبوونەوە و منداڵەکانی فەزارە لەدرێژایی خەڵکان بەجێ ماون. لەهەر لایێکەوە هێرشیان کردە سەریان. لەم کاتەدا مالیك کوڕی سەبیعی تەغلەبی گەورەی غەتەفان کوژرا و منداڵەکانی فەزارە هاوڕێ لەگەڵ حوزەیفە (کە هاوڕێ لەگەڵ چەند کەسێك بوو) شکستیان خوارد. حوزەیفە لەگەڵ پێنج کەس بەتەنیا مایەوە و هەڵات. هەواڵی هەڵاتنی ئەو بەمنداڵەکانی عەبەس گەشت. لەم کاتەدا، قەیس کوڕی زوهەیر و رەبیع کوڕی زیاد و قێراوش کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەسلەع و ریان کوڕی ئەسلەع ( کە حوزەیفە دو کوڕی کوشتبوو) بەدوایدا ڕۆشتن و شەوانە شوێنی کەوتن. قەیس وتی: دڵنیام ئەم خەڵکە

لەسەر ئەستێری جەفرۆ ئەلهبائە دادەبەزن بۆ ئەوەی وچان بگرن. قەیس و هاوەڵانی سەراسەری شەو بەغاردان ڕۆشتن تا لەکاتی هەڵاتنی هەتاو، ئەوانیان لەسەر ئەستێری جەفرۆ ئەلهبائە گرت. ئەوان ئەسپەکانی خۆیان بەرەڵا کردبوو، بەرەو لایان ڕۆشتن بەڵام قەیس و هاورێکانی ڕێگەیان لێگرتن. براکەی حوزەیفە، حەمل کوڕی بەدر و کوڕەکەی حیسەین کوڕی حوزەیفە و کەسانیتر لەگەڵیدا بوون. قەیس و ڕەبیع و هاورێکانیان هێرشیان کردە سەریان و هاواریان دەکرد: گەشتین! گەشتین! مەبەستیان ئەوە بوو ئێستا وەڵامی ئەو منالآنە دەدەنەوە کە لەکاتی کوژران هاواری (ئاخ باوەگیانیان) سەردابوو. قەیس بەوانی وت: ئەی منالەکانی بەکر، دواهاتی ستەمکاریتان چۆن بینی؟ ئەوان، ئەوانیان بەخواوەند و خزمایەتی سوێند دا کەدەست لەکوشتار هەلگرن بەڵام قەیس و هاورێکانی رازی نەبوون؟ قێراوش کوڕی عەمرۆ سوڕا و خۆی گەیاندە پشت حوزەیفە و زەربەتێکی لێدا و کەمەری شکاند. حوزەیفە خۆی قێراوشی پەروەردە کردبوو و تا تەمەنی گەورەیی لەماڵی ئەودا دەژیا. حەملی برای حوزەیفەیشیان کوشت و سەری هەردووکیان بڕی و حیسەین کوڕی حوزەیفەیان بەرەڵا کرد چوونکە منالْ بوو. لەم شەڕەدا لەفەزارە، ئەسەد و غەتەفان زیاتر لەچوارسەد کەس کوژران. فەزارە ئەم شەڕەی بەشەڕی (بەوار) ناوبرد. قەیس کوڕی زوهەیر وتی:

اقام على الهباءة خير ميت — و اكرمه حذيفة لا يريم

لقد فجعت به قيس جميعا — موالى القوم و القوم الصميم

و عم به لمقتله بعيد — و خص به لمقتله حميم

ئەمە قەسیدەیە درێژ، هەروەها دەڵێت:

الم تر ان خير الناس طرا — على جفر الهباءة لا يريم

فلو لا ظلمه ما زلت ابكى — عليه الدهر ما طلع النجوم

و لكن الفتى حمل بن بدر — بغى وا لبغى مرتعه وخيم

واتاکەی: لەئەستێری هبائە باشترین مردووەکان لەخاکدا خەوتوون، بەرێزترینی ئەوان حوزەیفەیە کە لەشوێنی خۆی ناجوڵێت. لەمردنی ئەو هەموو قەیسیەکان خەمبارن، چ کۆیلەکان و چ ئازاد ئەندێشەکان. دوردەستەکانیش گرفتاری خەمی کوشتنی ئەو بوون وخزمانی نزیك بەتایبەتی خەمبار بوون. ئایا نەتبینی باشترینی خەڵك لەئەستێری جەفرۆ ئەلهبائەیە و لەشوێنی خۆی ناجوڵێت؟ ئەگەر ستەمکاری ئەو نەدبوو، رۆژگارەکان، تا ئەو کاتەی ئەستێرەیەك لەئاسمان بەربێت، بۆ ئەو دەگریام. بەلاّم ئەم لاوە، حەمل کوڕی بەدر، ستەمی کرد و ستەمە لەوەرگای نەخۆشی زابێت.

ئەوسا عەبەسیەکان لەکردەی خۆیان لەشەڕی جەفرۆ ئەلهبائە پەشیمان بوونەوە و یەکتریان سەرکۆنە کرد. منالّەکانی فەزارە لای سەنان کوڕی ئەبی حارسە کۆبوونەوە و لەوەی بەسەریان هاتبوو، گازندەیان کرد و گریان. ئەو، ئەم خەمەی بەگەورە زانی و عەبەسیەکانی سەرکۆنە کرد و سوێندی خوارد کە بێ گومان عەرەبەکان لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و تۆڵەی منالّەکانی بەدر و فەزارە دەگرێت.ئەو نێردراوەکانی خۆی بەرێکرد. لەعەرەبەکان خەڵکانێکی زۆر کۆبوونەوە. ئەو بەهاوەلاّنی خۆی وت دەست لەسامانەکان نەدەن و تالاّنی نەکەن و خۆڕاگر بن. ئەوان بەرەو عەبەسییەکان بەرێکەوتن. عەبەسیەکان لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوونەوە و قەیس بەخەڵکەکەی خۆی وت: بۆچونی پەسەند ئەوەیە شەڕیان لەگەڵ نەکەین چوونکە ئەوانمان خەمبار کردووە. هەنوکە ئەوان خوازیاری خوێن و تۆڵەی کۆنن. دوێنێ بینیان بەهۆی تالاّنییەوە چییان بەسەر هات. ئەمجارە ئەو کارە ناکەن، ئەوەی دەبێت هەنوکە بیکەین، ئەوەیە ژنان و منالاّن و سامانەکان بەرەو منالّەکانی عامیر بنێرین کەخوێن پێش لەوان (ژنان و منالاّن) لەگەردنی ئێمەدایە و ئەوان هێرش ناکەنە سەریان. لێرە تەنیا پیاوانی بەهێز و سوارچالاك لەسەر ئەسپەکان بمێننەوە و ئێمە شەڕ لەزیانی ئەوان درێژ دەکەینەوە و ئەوان هیلاك دەکەین و مەبەستی ئاشتی دێنینە پێش. ئەگەر لەسەر شەڕ پێداگریان کرد، ژنان و کەسەکان و سامانەکانی خۆمان رزگار کردووە، لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەین و خۆڕاگری دەنوێنین.

ئەگەر سەرکەوین، بەمەبەستی خۆمان گەشتوین و ئەگەر نا، خۆمان ئامادە دەکەین و سوار لەسەر ئەسپە تیژ پێکان پەیوەستی کەسەکان و سامانەکانی خۆمان دەبین.

ئەم کارەیان کرد. منداڵەکانی زوبیان و هاوەڵەکانیان هاتن و لە(زاتی جەراجێر) خۆیان بەمنداڵەکانی عەبەس گەیاند. لەو رۆژدا شەڕێکی قورسیان کرد و دواتر لەیەك جیابوونەوە. بۆ بەیانی، بۆ شەڕ هاتنەوە و قورستر لەرۆژی پێش شەڕیان کرد. لەم رۆژەدا دلێری عەنتەرە کوڕی شەداد ئاشکرابوو. کاتێك خەڵك قورسی شەڕەکەیان ببینی و چاویان بەکوژراوە زۆرەکان کەوت، سەرکۆنەی سەنان کوڕی ئەبی حارسەیان کرد لەبەر ئەوەی رێگەی ئاشتی لەگەڵ حوزەیفە نەگرتەبەر. فاڵی خراپیان لێدا و پێیان وت زیاتر لەمە خوێن نەرێژێت و لەدرگای ئاشتی بدات. ئەو رازی نەبوو، ویستی لەسێیەم رۆژیشدا درێژە بەشەڕ بدات. کاتێك سستی و ئاشتی خوازی هاورێکانی خۆی بینی، جڵەوی گرت و گەڕایەوە. کاتێك ئەو کۆچی کرد، قەیس و منداڵەکانی عەبەس ڕۆشتنە لای منداڵەکانی شەیبان و منداڵەکانی بەکر و بوونە دراوسێی ئەوان. رۆژگارێك لای ئەوان مانەوە. قەیس لەدەست کوڕەکانی منداڵەکانی شەیبان کاری ناشیرینی زۆری بینی وەك زیان گەیاندن بەسامانەکان و ئازاردانی ژنان. پشتی لەوان کرد و کۆچی کرد. دەستەیەك لەمنداڵەکانی شەیبان شوێنیان کەوتن. منداڵەکانی عەبەس لەبەرابەر ئەواندا خۆراگریان کرد و شەیبانییەکان شکستیان خوارد. عەبەسیەکان بۆ هیجر کۆچیان کرد تا ببنە هاوپەیمانی پاشای ئەوێ، معاویە کوڕی حارسی کیندی. معاویە مەبەستی ئەوەی کرد شەوانە هێرش بکاتە سەریان. هەواڵەکە بە گوێی منداڵەکانی، عەبەس گەشت و بەپەلە رایان کرد. معاویە بەخێرایی شوێنیان کەوت. رێنیشاندەر بەئەنقەس ئەوانی بۆ رێگەیەکی دیکە برد تا لەدوای هیلاکی خۆیان و ئەسپەکانیان رووبەرووی عەبەسییەکان ببنەوە. هاورێکانی معاویە لە( فرووق) پێیان گەشتنەوە وشەڕێکی قورسیان دەستپێکرد و دەرئەنجام بەشکانی معاویە و خەڵکانی هەجەر کۆتایی هات. عەبەسیەکان شوێنیان کەوتن و دەستیان بەسەر سامانی ئەواندا گرت و ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت و گەڕانەوە و لەئاوێك بەناوی (عۆراعێر) کە بەشێك لەکەلب لەوێدەژیان، دابەزین. خۆیان ئامادە کرد تا لەگەڵ منداڵەکانی عەبەس شەڕ بکەن.

رەبیع هاتەدەر و داوای سەرکردەی ئەوانی کرد. ئەو کەناوی مەسعود کوڕی مساد بوو، هاتە لای رەبیع. ئەو دوانە شەڕیان کرد و کەوتنە سەر زەوی. مەسعود هەوڵی دا رەبیع بکوژێت بەلاّم لەم کاتەدا خودەکەی مەسعود کەوتەخوار و پیاوێك لەعەبەسیەکان تیرێکی لەقورگیدا و دەستبەجێ کوژرا. رەبیع پەلاماریدا و سەری بڕی. عەبەسیەکان هێرشیان کردە سەر کەلبییەکان و سەر براوەکەیان بەرمەوە کرد. کەلبیەکان تێك شکان و عەبەسیەکان ژن و سامانەکانی ئەوانیان تالاّن کرد. ئەوسا رۆشتنە یەمامە و لەگەڵ خەڵکەکەی لەمناڵەکانی حەنیفە بوونە هاوپەیمان و سێ ساڵ لەناو ئەواندا مانەوە. حەنیفییەکان رێزیان لەدراوسێیەتی ئەوان نەگرت و تەنگیان پێ هەڵچنین. عەبەسییەکان لەوێش کۆچیان کرد. ئێستا زۆربەی ئەوان بلاّو ببوونەوە و زۆریشیان کوژراو بوو. چوارپێکانی ئەوان بەرەو لەناوچون دەرۆشتن و عەرەبەکان داوای خوێنیان دەکرد. لەم زەمانەدا مناڵەکانی زەببە پەیامیان بۆ ناردن وپێشنیاری مانەوە لەناو خۆیانیان پێدان تا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ تەمیمیەکان هاوکارییان لێوەربگرن. عەبەسییەکان رازی بوون و لەدراوسێیەتی ئەوان دابەزین.

کاتێك کێشەی نێوان تەمیم و زەببە کۆتایی هات، مناڵەکانی زەببە ویستیان مناڵەکانی عەبەس تالاّن بکەن. مناڵەکانی عەبەس شەڕیان لەگەڵ کردن وسەرکەوتن و سامانەکانی ئەوانیان تالاّن کرد. عەبەسیەکان دوای ئەوە بۆ لای مناڵەکانی عامیر کۆچیان کرد و بوونە هاوپەیمانی ئەحوەس کوڕی جەعفەر کوڕی کلاب. ئەو لەهاتنی ئەوان شادمان بوو چوونکە دەیویست لەوان بۆ شەڕ لەگەڵ تەمیمیەکان کەڵك وەربگرێت چوونکە دەیزانی لەقیت کوڕی زورارە دەیەوێت شەڕی عەمارییەکان بکات و خوازیاری خوێنی براکەی مەعبەدە. تەمیمیەکان مەبەستی ئەوانیان کرد و شەڕی (شەعب جەبەلە) رویدا کەبەخواستی خوا ئاماژەی پێ دەدەین.

دواتر زوبیانییەکان رۆشتنە شەڕی مناڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە و مناڵەکانی عەبەسیان لەناو ئەواندا بینی. شەڕ رویدا و عامرییەکان شکستیان خوارد و قێرواش کوڕی هونەی عەبەسی ئەسیر کرا بەلاّم کەس نەیناسییەوە. کاتێك

ئەویان هێنایە ناو هۆزەکەیان، ژنێك لەوان ئەوی ناسییەوە. ئەویان بەحەسەن کوڕی حوزەیفە سپارد کەکوشتی. دوبارە عەبەسیەکان لەناو ئەمان کۆچیان کرد و لەناو منالەکانی تیم ئەلرباب دابەزین. تیم ستەمی لەوان کرد و شەڕێکی قورسی لێکەوتەوە. منالەکانی تیم ئەلرباب لەوان زۆرتر بوون و زۆر لەعەبەسییەکانیان کوشت. عەبەسییەکان کۆچیان کرد و ئیتر لە شەڕ و خوێن ڕشتن بێزار ببوون و ژمارەی پیاوەکانیان کەمی کردبوو. سامانەکانیان کەم و چوارپێ و مەڕ و مالآتەکەیان فەوتابوو. قەیس پێی وتن: چارە لەچیدا دەبینن.؟ وتیان: بەرەو لای خەلك و براکانمان لەمنالەکانی زوبیان دەڕۆین کە مەرگ لەگەلّ ئەوان باشتر لەمانەوە لای کەسانیترە. عەبەسییەکان بەرێکەوتن و شەوانە ڕۆشتنە لای حارس کوڕی عەوف کوڕی ئەبی حارسە موڕی یا هەرێم کوڕی ئەبی سەنان کوڕی ئەبی حارسە. ئەو لەم کاتەدا لای حیسن کوڕی حوزەیفە کوڕی بەدر بوو. کە هاتەوە و ئەوانی بینی، بەخێرهاتنی کردن و پرسی: میوانەکان کێ بن؟ وتیان: براکانت لەمنالەکانی عەبەس. ئەوان نیازەکەی خۆیان وت: هەرێم وتی: باش بن و بەخێر بێن. بڕۆم و حیسن کوڕی حوزەیفە ئاگادار بکەمەوە.

گەڕایەوە لای حیسن وتی: پێویستییەکەم بەتۆهەیە بۆیە شەوانە لەمالەکەی تۆ ئەدەم. حیسن وتی: نیازەکەت بەدی دێنم. وتی: نوێنەری عەبەسییەکان لەمالەکەی مندان. حیسن وتی: لەگەلّ خەلکەکەی خۆتان ئاشتی بکەن. بەلآم من نەخوێنبایێم دەوێت نەخوێنبایی دەدەم. باوکان و مامەکانی من بیست کەس لەعەبەسیەکانیان کوشت. ئەو گەڕایەوە لای عەبەسییەکان و ئاگاداری کردنەوە. داتر عەبەسیەکانی بردە لای حیسن. کاتێك حیسن ئەوانی بینی، قەیس و رەبیع کوڕی زیاد وتیان: سوارانی مەرگین. حیسن وتی: نەسوارانی ئاشتین. ئەگەر ستەمتان لەخەلکەکەی خۆتان کردووە، ئەوانیش ستەمیان لێکردوون. لەگەلّ ئەوان هاتەدەر و هەموویان ڕۆشتنە لای سنان و حیسن وتی: کاری خەلکەکەت رێکبخە وئاشتی لەناو ئەواندا سەقامگیر بکە و لەم کارەدا هاوکاریت دەکەم. ئەو کارەی کرد و ئاشتی سەقامگیر بوو و عەبەسییەکان گەڕانەوە.

دستەیەك دەلێن: قەیس کوڕی زوهەیرلەگەلّ عەبەسییەکان نەڕۆشتە لای

منداڵەکانی زوبیان و وتی: نامەوێت چاوی هیچ ژنێکی غەتەفانی بەمن بکەوێت چوونکە برا یا مێرد یا کوڕ یا ئامۆزای هەرکام لەوانم کوشتووە. ئێستا بۆ لای خوا دەگەڕێمەوە. ئەو بووە پارێزکار و دەستی بەگەڕان کرد تا گەشتە عەمان و ماوەیەك لەوێ مایەوە. حوج کوڕی مالیکی عەبدی ئەوی بینی و ناسییەوە، کوشتی و وتی: خوا من نەبەخشێت ئەگەر تۆ ببەخشم.

دەستەیەك دەڵێن: قەیس لەنەمیر کوڕی قاست ژنێکی کردە هاوسەر و ئەمە لەکاتێکدا بوو عەبەسیەکان بۆ لای زوبانییەکان دەگەڕانەوە. بۆ ئەو کوڕێکی هێنایە دنیا کە ناوی نا فەزاڵە. ئەو هاتە لای پێغەمبەر و پێغەمبەر ئەوی کردە سەرکردەی خەڵکەکەی خۆی کە نۆ کەس بوون و ئەو دەیەمین. شەڕی داحیس و غەبرا کۆتایی هات. سپاس بۆ خوا.

## شەڕی شەعب جەبەلە

لەقیت کوڕی زوراره مەبەستی شەڕی منداڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعەی کردبوو تا تۆڵەی براکەی مەعبەد وەربگرێت. پێشتر ئاماژەمان پێدا کەئەو ئەمیری ئەوان و لەئەسیریدا مرد. پێش مردن خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. لەهاوپەیمانی منداڵەکانی عەبەس و منداڵەکانی عامیر ئاگادار بوویەوە. بەبیستنی ئەو هەواڵە لەهێرش کردنە سەر ئەوان چاوی پۆشی و بۆ هەموو ئەو هۆزانەی دوژمنایەتیان لەگەڵ منداڵەکانی عەبەسدا هەبوو، پەیامی نارد و خوازیاری هاوپەیمانی و هاوپشتی بۆ شەڕی منداڵەکانی عەبەس و منداڵەکانی عامیر بوو. بەدوای ئەوە، منداڵەکانی ئەسەد و منداڵەکانی غەتەفان و عەمرۆ کوڕی جەون و معاویە کوڕی جەون لەدەوری کۆبوونەوە و پەیوەندی دۆستایەتییان لەگەڵدا بەهێز کرد و ژمارەیان زیادی کرد و بەرێکەوتن. معاویە کوڕی جەون ئاڵاکانی هەڵکرد. منداڵەکانی ئەسەد و منداڵەکانی فەزاره لەژێر ئاڵاکەی ئەودا کۆبوونەوە. ئەو ئاڵای حاجب کوڕی زوارەی بۆ عەمرۆ کوڕی تەمیم، ئاڵای حەسان کوڕی هوسامی بۆ رباب، ئاڵای دەستەکانی لەهۆزەکانی تەمیم بۆ عەمرۆ کوڕی عودەس و هەموو حەنزەلەی بۆ لەقیت کوڕی زوراره بەست. دەختەنوس کچی لەقیت لەگەڵ ئەودا بوو. ئەو ئەم کچەی لەگەڵ خۆی بۆ شەڕدەبرد، لەگەڵ ئەودا شەڕی دەکرد و لەکارەکاندا راوێژی پێدەکرد.

ئەمانە لەگەڵ سوپایەکی زۆرەوە بەرێکەوتن و گومانیان نەبوو کەمنداڵەکانی عامیر و منداڵەکانی عەبەس لەناو دەبەن و تۆڵەی خۆیان لەوان دەستێننەوە. لەقیت لەسەر رێگای خۆی کەربی کوڕی سەفوان کوڕی حوبابی سەعدی بینی. ئەو پیاوێکی بەرێز بوو. لێی پرسی: بۆ لەگەڵ ئێمەدا بۆ شەڕ نایێت؟ کەرب وتی: بەدوای وشترە گوم بووەکانمدا دەگەڕێم. لەقیت وتی: وانییە، بەڵکو دەتەوێت دوژمنەکەمان لەهاتنی ئێمە ئاگادار بکەیتەوە. تۆ ئازاد ناکەم مەگەر ئەوەی سوێند بخۆیت ئەوان ئاگادار نەکەیتەوە. ئەو سوێندی خوارد کەئەوان ئاگادار ناکاتەوە و تووڕە لای لەقیت کوڕی زوراره ڕۆشت. کاتێك کەرب کوڕی سەفوان لەمنداڵەکانی عامیر نزیك بوویەوە،

پارچەیەی هەلگرت و ئەمانەی تیا جێکردەوە: حەنزەلێك (شوتییەکی تاڵ بەناوی شوتی ئەبو جەهل)، بڕێك خاك، بڕێك دڕك، دو تیکە پارچەی یەمەنی، تیکە پارچەیەکی سور و دە دەنك زیخی ڕەش. ئەوسا ئەم پارچەی لەگەڵ هەموو شتەکانی ناوی هەلگرت و لەو شوێنەی منالّەکانی عامیر لەدەوری ئاو کۆببوونەوە و مەڕ و مالأتی خۆیان ئاو دەدا، بۆ ئەوان هاویشت و قسەی نەکرد. معاویە کوڕی قوشەیر ئەوانی هەلگرت و بردییە لای ئەحوەس کوڕی جەعفەر و پێی وت: ئەمانە لە کاتێکدا مەڕ و مالأتی خۆمان ئاودەدا، ڕێبوارێك هاویشتی و هیچی نەوت. ئەحوەس بەقەیس کوڕی زوهەیر عەبەسی وت: چی لەمەدا دەبینی؟ قەیس وتی: ئەم کارە، کاری خوایە. ئەم پیاوە کەسێك بووە پەیمانیان لێوەرگرتووە قسە نەکات. ئەو بەئێوە دەڵێت دوژمنانێك بەئەندازەی خاکەکان (زیخەکانی بیابان) هێرش دەکەنە سەر ئێوە. دوژمنەکانتان زۆر بەهێزن. حەنزەل وەك بڵێی سەرکردەی سوپای دوژمنە. دو پارچەی یەمەنی یانی دوو تیرە لەهۆزەکانی یەمەن. پارچەی سور نیشانەی حاجب کوڕی زورارەیە و دە دنکە زیخەکە نیشانەی ئەوەیە دوژمنان تا دە شەوی دیکە هێرش دەکەنە سەر ئێوە. ئێوەم ئاگادار کردەوە. ئازاد بن و خۆراگری بکەن بەهەمان شێوە کە گەورە پیاوە بەڕێزەکان دەیکەن.

ئەحوەس کوڕی جەعفەر وتی: ئەم کارە دەکەین و بۆچونەکانی تۆ لەگوێ دەگرین چوونکە هیچ دژواریەك بۆ تۆ نەهاتە خوار مەگەر ئەوەی ڕێگەچارەت بۆ دۆزییەوە. قەیس کوڕی زوهەیر وتی: ئێستا کە دەتانەوێت گوێ لەباوەڕ و بۆچونی من بگرن، چوارپێ و مەر و مالأتەکەی خۆتان بۆ دۆڵی جەبەلە ببەن و ئاویان مەدەن و بۆ چەند ڕۆژ بەتینویەتی بیانهێڵنەوە. کاتێك دوژمنان هاتن، وشترەکان بەرەولای ئەوان بەرەلا بکەن و بەشمشێر و ڕم ئازاریان بدەن تا ترساو و تینو بەرەو لای ئەوان ڕەم بکەن و ئەوان پرژ و بلأو بکەنەوە. ئەوسا ئێوە بەدوای وشترەکانی خۆتان بێنەدەر ودڵی خۆتان لەخواردنەوەی خوێنی ئەوان فێنك بکەنەوە.

کەرب کوڕی سەفوان گەڕایەوە و چاوی بەلەقیت کەوت. لەقیت پێی وت: ئەم خەڵکەت ئاگادار کردەوە؟ کەرب سوێندەکەی خۆی دوبارە هێنایە سەر زمان کەهیچ قسەیەکی نەکردووە. لەقیت ئەوی ئازاد کرد. دەختەنوس کچی لەقیت بەباوکی

خۆی وت: من بۆ لای کەسەکانم بگەڕێنەرەوە و گرفتاری عەبەسییەکان و عامرییەکانم مەکە چوونکە ئەم پیاوە بێ گومان ئەوانی ئاگادار کردۆتەوە. ئەو کچەکەی خۆی بە ناعاقڵ و نەزان ناوبرد و لەوتەکەی رەنجا و ئەوی گەڕاندەوە.

لەقیت بە سوپا زۆر و شەڕانییەکەی خۆی کەدەنگی حیلە ئەسپەکانیان گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد، گەشتە بەردەمی دۆڵەکە. سوپاکەی جگە لەناو مەبەستێکیان نەبوو و دەیانویست بەخێرایی بەرەو لای ئاوەکە بڕۆن. ئەوان هاتنەسەر ئاوەکە. قەیس کوڕی زوهەیر وتی: هەر ئێستا وشترەکان بەرەڵا بکەن. وشترەکان ترساو و تینو رویان لەئاوەکە کرد و عەبەسییەکان و عامرییەکان بەدوایاندا و ئەوانیان بۆ پێشوە دەبرد و ئازاری کەلەکە و سکیان دەدان. وشترەکان، تەمیمیەکان و هاوەڵەکانیان پێ شێل و پرژ و بڵاو کرد و لەدۆڵەکەوە بۆ بیابان راویان نان و رێکخستنی ئەوانیان تێکدا. سوپاییەکان لەئاڵاکانی خۆیان دوور کەتنەوە و عەبەسیەکان و عامریەکان هێرشیان کردە سەریان و شەڕێکی قورسیان لەگەڵدا کردن. کوژراودکانی مناڵەکانی تەمیم روی لەزیاد بوون کرد.

یەکەم کەس لەگەورەکانی ئەوان کە لەناو خوێنی خۆیدا تلایەوە، عەمرۆ کوڕی جەون بوو. معاویە کوڕی جەون و عەمرۆ کوڕی عەمرۆ کوڕی عودەس، مێردی دەختەنوس کچی لەقیت و حاجب کوڕی زوراره بەدیلی گیران. لەقیت کوڕی زوراره روی کردە گۆڕەپانی شەڕ و بانگی خەڵکەکەی خۆی دەکرد کەژمارەیەکی کەم لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو ئاڵاکەی خۆی لەدەوری کێوەکە هەڵکرد و دواتر هێرشی کردە سەر ئەوان و کوشتی و بریندارى کرد و گەڕایەوە و هاواری کرد: من لەقیتم. دوبارە هێرشی کردە سەریان، کوشتی و بریندارى کرد و گەڕایەوە. سوپاکەی روی لەزیاد بوون کرد. لەداوێنی کێوەکە بەخێرایی هاتەخوار و ئەسپەکەی خۆی تاودا بەڵام لەم کاتەدا عەنتەرە کوڕی شەداد پەلاماریدا و بەشمشێری لێیدا و بڕبڕەی پشتی قەڵشاند. قەیس کوڕی زوهەیر بەشمشێر ئەوی لەخوێنی خۆیدا تلاندەوە. لەقیت کوڕی زوراره کچەکەی دەختەنوسی بیرهێنایەوە و هۆنییەوە:

يا ليت شعرى عنك دختنوس اذا اتاها الخبر المرموس
ا تحلق القرون ام تميس لابل تميس انها عروس

واتاکەی: خۆزگە دەمزانی کاتێك ئەم هەواڵە نهێنی و داپۆشراوە بەگوێی دەختەنوس دەگات، چی دەکات. ئایا قژی خۆی دەتاشێت یا سوراو و سپیاو لەروخساری دەدات. نە، بێگومان روخساری دەرازێنێتەوە چوونکە تازەبووکێکی گەنجە.

ئەوسا مرد. تەمیمیەکان و غەتەفانییەکان شکستیان خوارد و حاجب کوڕی زوراره لەگەڵ پێنسەد وشتر و عەمرۆ کوڕی عەمرۆیان بەدوسەد وشتر کڕییەوە و ئەوانەی تەندروست رزگاریان ببوو، بۆ ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە. دەختەنوس چەندین قەسیدەی لەپرسەی باوکیدا وت کەیەکێك لەوان بەمشێوەیە:

عثر الاغر بخير خنـ ـدف كهلها و شبابها
و اضرها لعدوها و افكها لرقابها
و قريعها و نجيبها فى المطبقات و نابها
و رئيسها عند الملو ك و زين يوم خطابها
و اتمها نسبا اذا رجعت الى انسابها
فرعى عمودا للعشيـ ـرة رافعا لنصابها
ويعولها و يحوطها و يذب عن احسابها
و يطا مواطن للعد و فكان لا يمشى بها
فعل المدل من الاسو د لحينها و تبابها
كالكوكب الدرى فى سيماء لا يخفى بها
عبث الاغر به وكـ ـل منية لكتابها
فرت بنو اسد فرا ر الطير عن اربابها
و هوازن اصحابهم كالفار فى اذنابها

واتاکەی: مەرگ بۆ باشترین پیاوانی هۆزی خیندەف، لەپیر و گەنج، هاتە خوار. ئەوەی بۆ دوژمن مەترسیدارترین بوو و زیاتر لەهەموو کەسانیتر دیلەکانی رزگار دەکرد، سەروەری خەڵکی خۆی و گەورەی ئەوان بوو و پاسەوانی ئەوان لەدژوارییە گەورەکان و رێزداری ئەوان. سەرکردەی ئەوان لای شاکان و رازێنەرەوەی رۆژی وتاردانی ئەوان. ئەوەی کاتێك خەڵك نەژادنامەی خۆیان دیاری دەکرد، نەژاد نامەیەکی تەواوتری لەهەمووان بوو. ستونی خەڵکەکەی خۆی هەڵدەکرد و بەشی ئەوانی بەرز رادەگرت. بەدەوری خەڵکەکەی خۆی دەسوڕا، چاودێری دەکردن و رێزی لێدەگرتن. خواردنی دەدان و ئاگای لێیان بوو و لەنەژاد و شکۆمەندی ئەوان، لەبەرابەر ناحەزان بەرگری دەکرد. لەو شوێنانە لەخاکی دوژمن پێشڕەوی دەکرد کەهیچ بوێرێك بوێری ئەو کارەی نەبوو. کارێك کەشێرانی ژیان و ئازا دەیکەن و لەدژواری و سەختی و لەناوچون ناترسن. وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوە لەئاسماندا بوو کە لەبەرچاو ون نەدەبوو. مەرگ گەمەی بەچارەنوسی دەکرد. هەر سەرەتایەك نوسراوێکی هەیە. ئەسەدییەکان هاوشێوەی مەلانێك کە لەخاوەنەکەی خۆیان هەڵدێن، هەڵاتن و منداڵەکانی هوازین وەك مشکەکەکان خزانە ناو کونەکانی خۆیان.

موحەمەد کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەشەڕی دۆڵی جەبەلە گێڕانەوەیەکی جیاوازی لەگێڕانەوەکەی ئێمە ئاماژە پێداوە. دەڵێت: هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو منداڵەکانی خیندەف لەنزیك قەیس لەوەڕگایەکیان بوو کە(قعدە) کانی (خزمەکانی) خیندەف بەکاریان دەبرد. ئەم لەوەڕگایە لەناو ئەوان بوو تا بەتەمیم گەشت و لەتەمیم بەدەست منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی تەمیم کەکەمترین و بچوکترین تیرە بوون. قەیس لەدانی لەوەڕگا خۆی دوورخستەوە. تەمیمیەکان کۆبوونەوە و لەگەڵ عەرەبەکانیتر یەکیان گرت و بەرەو لای قەیس بەرێکەوتن. درێژەی داستان ئەوەیە کەئێمە ئاماژەمان پێدا هەرچەندە لەهەندێ بەشدا جیاوازی هەیە بەڵام پێویست بەئاماژەدان ناکات.

## لەم رۆژەدا عامیر کوڕی تفیل عامیری لەدایك بوو.

دەستەیەك لەزاناکان وتویانە: دەستەیەك لەعەرەبەکانی بەحرەین ئاینی گبران(ئاگرپەرستەکانیان)بوو. لە ناو ئەوان زورارە کوڕی عودەس و حاجب و لەقیت و ئەقرەع کوڕی حابس و..لەسەر ئاینی ئاگر پەرستی بوون. ئەو لەگەڵ کچەکەی خۆی دەختەنوس پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و ئەم ناوە فارسییەی لێنا. کاتێك کوژرا هاوسەری ئەم کچە بوو. لەبەر ئەمە ئەم شێعرەی بۆ وت:

### یا لیت شعری دختنوس

تا کۆتایی بەیتەکان.

وتاری یەکەم راسترە و خوا زاناترە.

## شەڕی زات نەکیف

مناڵەکانی بەکر کوڕی عەبد مەناف دوژمنی قورەیشیەکان بوون و ڕقی ئەوانیان لەدڵدابوو. ئەم دوژمنایەتی و رق هەڵگرتنە لەو کاتەوە دەستی پێکرد کەقوسەی ئەوانی هاوڕێ لەگەڵ خوزاعە لەمەککە دەرکرد و شارەکەی خۆی بۆ چەندین کۆڵان و گەڕەك دابەش کرد و بەقورەیشیەکانی سپارد. کاتێك ڕۆژگاری عەبدئەلموتەلیب گەشت، هەوڵیاندا قورەیشیەکان لەبارەگایی خوایی دەربکەن، شەڕ لەگەڵ ئەوان بکەن و تا سەرکەوتنی تەواو درێژبە شەڕ بدەن. مناڵەکانی بەکر هێرشیان کردە سەر دەستەیەك لەچوارپێ و مەڕ و ماڵاتەکەی هوازین و ئەوانیان ڕەم دا و دواتر شەڕکەرانی خۆیان کۆکردەوە و قورەیشیەکانیش خۆیان کۆکردەوە و سوپاکەی خۆیان ئامادە کرد. عەبدئەلموتەلیب لەنێوان قورەیش وئەحابیش پەیمانی بەست و ئەوانی کردە هاوپەیمان. ئەحابیش ئەمانە بوون: مناڵەکانی حارس کوڕی عەبدمەنات، مناڵەکانی هون کوڕی خەزیمە کوڕی مۆدرەکە و مناڵەکانی مستەلەق لەخوزاعە. ئەوان ڕوبەروی مناڵەکانی بەکرو هاوەڵەکانیان بوونەوە. فەرماندەی قورەیشیەکان عەبدئەلموتەلیب، باوەگەورێی پێغەمبەر بوو. هەردوولای شەڕ لەشوێنێك بەناوی (زات نەکیف) چاویان بەیەك کەوت و شەڕیان دەست پێکرد. مناڵەکانی بەکر شکستیان خوارد و کوشتار کران و ئیتر شەڕی قورەیشیان نەکردەوە. کوڕی شوعلەی فێهری لەمبارەوە وتی:

فلله عينا من راى من عصابة — غوت غى بكر يوم ذات نكيف

انا خوا الى ابياتنا و نسائنا — فكانوا لنا ضيفا بشر مضيف

واتاکەی: خوا فریایی دەستەیەك بکەوێت کەوەك بەکرییەکان لەشەڕی زات نەکیف گرفتاری گومرایی بوون. سوارەکانی ئەوان ڕویان لەماڵ و ژنانی ئێمە کرد و بوونە میوانمان بەڵام لای مەترسیدارترین میوانەکان دابەزین کەخواردنی مەرگیان بۆ هێنان.

لەم ڕۆژەدا عەبد ئەلسەفاحی قاری لەهۆزی قارە، قتادە کوڕی قەیس برای بەلعا کوڕی قەیسی کوشت کەناوی مساحق کوڕی قەیس بوو. لەم ڕۆژەدا بوو ئەم پەندە عەرەبیە هاتە ئاراوە: هەرکەس تیر بۆ قارە بهاوێت، داد بەدیدێنێت. قارییەکان لەمناڵەکانی هون کوڕی خەزیمە بوون و ئەو لەمناڵەکانی عەزەل کوڕی دیش. یەکێك لەپیاودکانی ئەوان وتی:

دعونا قارة لا تنفرونا فنجفل مثل اجفال الظليم

واتاکەی: بە قاریەکانمان وت ئێمە مەتارێنن تا وەك وشترملە نێرەکان ڕەم بکەین و هەڵبەز و دابەز بکەین.

دەڵێن: ئەم شێعرە بوو ئەوانی بەناوی قارە بەناوبانگ کرد. قاریانیەکان بەناوی (تیرهاوێژان بۆ کاسەی چاو)ناودەبرد.

## شەڕی یەکەم و دووەمی فەجار

لە شەڕی یەکەمی فەجار شتێکی ئەوتۆ روینەدا کە شیاوی ئاماژە پێدان بێت. لەبەر ئەوە ئاماژەمان پێدا کە دوای ئاماژەدان بەفەجاری دووەم و رووداوەکانی گومان نەکرێت فەجاری یەکەم هاوشێوەی ئەم جەنگە بووە و ئێمە لەبیرمان کردووە. لەبەر ئەمەیە ئاماژەی پێدەدەین.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: شەڕی فەجاری یەکەم لەنێوان قورەیشیەکان و هاورێکانیان (هەموو کەنانە) و قەیس کوڕی عەیلان رویدا. هۆکارەکەی ئەوە بوو پیاوێك لەکەنانە قەرزێکی لەملی بەسود پیاوێك لەمناڵەکانی نەسر کوڕی معاویە کوڕی بەکر کوڕی هوازین بوو. پیاوی کەنانی فەقیر و نەیتوانی قەرزەکەی خۆی بداتەوە. پیاوی نەسری لەگەڵ مەیمونێك هاتە ناو بازاری عەکاز و جارِیدا: کێیە ئەم مەیمونە لەبەرابەر قەرزەکەم لە فلاّن پیاوی کەنانی بەمن بفرۆشێت؟ ئەم قسەی وەك سەرکۆنەکردنی ئەو پیاوە و هەموو کەنانیەکان هێنایە سەرزمان. پیاوێکی کەنانی لەوێوە تێدپەڕی و کاتێك ئەمەی بیست شمشێری کێشا و لەرێگەی گەورەییەوە لەبەرابەر ئەوەی پیاوی نەسری دەیوت، مەیمونەکەی کوشت. پیاوی نەسری داوای یارمەتی لەقەیسیەکان کرد و پیاوی کەنانی لەکەنانییەکان. خەڵك کۆبوونەوە و گفتوگۆیان کرد و ئەوەندەی نەما بوو شەڕ روبدا بەلاّم ئاشتیان کرد.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکارەکەی ئەوەبوو چەند کەس لەگەنجەکانی قورەیش رویان کردە ژنێکی جوان لەمناڵەکانی عامیر کەروبەندێکی لەروخساردا بوو. پێیان وت: پەردە لەسەر روخسارت هەلگرە تا روخساری مانگ ئاسات ببینین. ئەو نەیکرد. یەکێك لەگەنجەکان داوێنی کراسەکەی لەپشتەوە بەشانیەوە بەستە و ژنەکە هەستی بەهیچ نەکرد. کاتێك هەستا سمت و ڕانە بلورینەکانی دەرکەوت و ئەوان پێکەنین و وتیان: روخسارت لەئێمە داپۆشی، ئێمە قونتمان بینی. ژن هاوار و شین و ڕۆڕۆی کرد و وتی: ئای عامرییەکان ریسوا بووم! خەڵك کۆبوونەوە و مشت و مڕ دەستی

پێکرد. زۆری نەمابوو شەڕ هەڵگیرسێت. دواتر بینیان شتێکی زۆر گەورە روی نەداوە. لەبەر ئەمە ئاشتیان کرد. دەستەیەك دەڵێن: پیاوێك لەمناڵەکانی غەفار کەپێیان دەوت باوکی مەعشەر کوڕی مێکرەز کەپیاوێکی ئازا و لەخۆرازی بوو، لەبازاری عەکازدا بوو. ئەو رۆژێك لەبازار دانیشت و قاچەکانی خۆی درێژ کرد وتی:

| | |
|---|---|
| نحن بنو مدركة بن خندف | من يطعنوا فى عينه لا يطرف |
| و من يكونوا قومه يغطرف | كانه لجة بحر مجرف |

واتاکەی: ئێمە مناڵەکانی مەدرەکە کوڕی خەندەفین. ئەو کەسەی ڕم لەچاوی بدەین، هیچ نابینێت و کوێر دەبێت و پشتیوانی هەرە کەسێك بین، شانازی بەخۆیەوە دەکات، وەك بڵێی شەپۆلەکانی دەریایی خرۆشاوە.

سوێند بەخوا من رێزدارترین پیاوی عەرەبەکانم. هەر کەس گومان دەکات لەمن بەرێزترە، بەشمشێر لەقاچی من بدات. پیاوێك لەقەیسیەکان بەناوی ئەحمەڕ کوڕی مازن دەستی بۆ شمشێر برد و لەقاچیدا و ڕووشانێکی نەچەندان گەورەی دروست کرد. خەڵك سەرەتا مشت ومڕیان کرد بەڵام دواتر ئاشتیان کرد.

فەجاری دووەم بیست ساڵ دوای داستانی فیل و دوانزە ساڵ دوای عەبد ئەلموتەلیب بوو. هیچ کام لەشەڕەکانی عەرەب نەگەشتە سەختی و ناوداری ئەم شەڕە. لەبەر ئەمە ناویان ناوە فەجار (شەڕی گوناحکارانە) چوونکە هەردوو لای شەڕکەر کەنانییەکان و قەیسیەکان کاری ناڕەوایان تیا کرد کەتەنانەت لەناو ئایینی ئەو وەحشیانەیشەدا ناڕەوا بوو. پێش لەوە، رۆژی شەڕی جەبەلە لەشەڕە ناودارەکانی عەرەبەکان بوو. فەجار لەویش قورستر بوو.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو بەراز کوڕی قەیس کوڕی رافعی زەمری پیاوێکی پیاو کوژ و خوێنرێژ و هەرزە بوو کەخەڵکەکەی بەهۆی کارە ناڕەوا و ناشیرینەکانی لەخۆیان دووریان کردبوویەوە. خەڵك بۆخوێنرێژی نمونەیان بەو دەهێنایەوە و دەیانوت: ((خوێنرێژتر لە بەراز). یەکێك بەتێروانینەوە پێی وت:

**و الفتى من تعرفتة الليالى فهو فيها كالحية النضناض**
**كل يومخ له بصرف الليالى فتكة مثل فتكة البراض**

واتاکەی: لاوی شەرکەر ئەو کەسەیە شەوانە ئەو بناسێتەوە و ئەو لەشەودا وەك مارێکە ئارامی نییە. هەر ڕۆژ کەتێپەڕێت و شەو دابێت، هاوشێوەی بەراز خوێنێکی ڕشتبێت.

ئەو ڕۆشتەدەر بۆ لای نەعمان کوڕی مونزەر. نەعمان ساڵانە ئەندازەیەك لەپارچە گرانبابییەکان و مادە بۆنخۆشکەرەکانی لەگەڵ کاروانێك دەنارد بۆ بازاری عەکاز تا لەوێ مامڵە و بازرگانی بکات و سودێك بەدەست بێنێت. سێ بازاری عەرەب یانی عەکاز، زوئەلمەجاز و مەجەنە بازارێکی ئەمن بوون کەعەرەبەکان لەکاتی حەج کردن (لە مانگەکانی حەرام) تیایدا کۆدەبوونەوە و تا کۆتایی هاتنی کاتی بازارەکان، لەیەك ئەمین بوون و یەکتریان نەدەکوشت. مەجەنە لەزەهران بوو، عەکاز لەنێوان تایف و نەخلە، و زوئەلمەجاز لەلای چەپ کاتێك ڕوبەڕووی شوێنی سەردان کەرانی ماڵی خوا دەوەستایت. ڕۆژێك کەبەراز و عەروە کوڕی عەتەبە کوڕی جەعفەر کوڕی کەلاب (ڕەحال)( گەشتیار: لەبەر ئەوەی بەردەوام لەسەفەر بۆ لای پاشاکان بوو)، لای نەعمان بوون، وتی: کێ کاروانەکەی من بەسلامەتی بۆ عەکاز دەبات؟ بەراز وتی: لەنفرین بەدور بیت، من لەبەرابەر کەنانە دەیپارێزم؟ نەعمان وتی: من خوازیاری ئەو کەسەم ئەم کاروانە لەبەرابەر کەنانە و قەیس بپارێزێت. عەروە وتی: لەنفرین بەدور بیت، ئایا کەسێکی بەرەڵا و دورخراوە لەخەڵکەکەی دەتوانێت ئەو کاروانە بۆ تۆ بپارێزێت؟ من لەبەرابەر خەڵکی شەیح و قەیسوم لەنەجدییەکان و پاشماوەکانی تەهامە دەیپارێزم. بەراز تووڕە بوو، وتی: ئەی عەروە، لەبەرابەر کەنانەیش دەیپارێزیت؟ عەروە وتی: لەبەرابەر هەموو خەڵکان.

نەعمان کاروانەکەی بە عەروەی گەشتیار سپارد و فەرمانی ڕەوانە کردنی پێدا. بەراز ڕۆشتەدەر و شوێن عەروە کەوت. عەرە ئەوی دەبینی بەڵام لێی نەدەترسا. کاتێك عەروە گەشتە ناو خەڵکەکەی خۆی و هاتە ناو دۆڵێك لەپانتایی فەدەك کە پێیان دەوت تەیمەن، بەراز کوڕی قەیس ئەوی بینی و تیرە فالگیرییەکانی خۆی

هێنایەدەر و لەبارەی کوشتنی عەروە فاڵی گرتەوە کەنایا بکوژێت یان نا. عەروە لای تێپەڕی و پرسی: چی دەکەیت بەراز؟ وتی: لەبارەی کوشتنی تۆ فاڵ دەگرمەوە بۆ ئەوەی فەرمانەکەی بەمن بدەن یا ڕێگەی ئەو کارەم لێبگرن. عەروە وتی: فونی تۆ تەنگتر لەومیە! بەراز بەشمشێر هێرشی کردە سەر و کوشتی. کاتێك راسپێردراوان وشترەکان و بارەکان عەرومیان بەکوژراو بینی، هەڵاتن. بەراز کاروانەکەی گرت و یەکسەرە ڕوی کردە خەیبەر. دو پیاو لەقەیس شوێنی کەوتن.یەکیان غەنەوی بوو و ئەویتریان غەتەفانی. ناوی غەنەوی ئەسەد کوڕی جەوەین و ناوی غەتەفانی مساوێر کوڕی مالیك. بەراز لەخەیبەر پێش هەر کەسێك چاوی بەوان کەوت و لێی پرسین: ئێوە دوو پیاو کێ بن؟

وتیان: لەقەیسیەکانین، هاتوین بەراز بکوژین. ئەو ئەم دوانەی هێنایە خوار و وشترەکانی بەستنەوە. دواتر پرسی: کام یەك لەئێوە لەو ئازاتر و لەدەرکێشانی شمشێر دەست ڕەنگین ترە؟ غەتەفانی وتی: من. بەراز ئەوی هەڵگرت و لەگەڵ خۆیدا بردی تا بەگومانی خۆی بەرازی نیشان بدات. بەغەنەویەکەی وت: ئاگای لەدوو وشترەکە بێت. غەنەوەی رازی بوو. بەراز، غەتەفانی لەگەڵ خۆی برد تا گەشتە کەلاوەیەك لەماڵەکان و دواتر بەغەتەفانی وت: بەراز لەم کەلاوەدایە و لێرەدا پەنا دەگرێت. دەرفەت بەمن بدە بزانم ئێستا لێرەدایە یانە. غەتەفانی وەستا و بەراز ڕۆشتە ناو و دواتر هاتەدەر و وتی: بەراز لەم کەلاوەدا خەوتووە، شمشێرەکەتم نیشان بدە بزانم بەکەڵك دێت یان نا. پیاوی غەتەفانی شمشێرەکەی پێدا. بەراز هەر بەشمشێرەکەی خۆی لێیدا و کوشتی و دواتر شمشێرەکەی شاردەوە و بۆ لای پیاوە غەنەوەیەکە گەڕایەوە و وتی: پیاوێکی ترسەنۆکتر لەهاورێکەی تۆم نەبینیوە، ئەوم بردە ماڵی بەراز کەتیایدا خەوتبوو بەڵام نەیتوانی لەخەودا بکوژێت. پیاوی غەنەوی بەبەرازی وت: کەسێك بدۆزەرەوە تا ئاگای لەم دوو وشترە بێت، خۆم دێم و دەیکوژم. بەراز وتی: وشترەکان بەجێ بێڵە. دواتر هەردووکیان بەرەو کەلاوەکە ڕۆشتن و بەراز ئەویشی کوشت و کاروانەکەی هەڵگرت و ڕێگەی مەککەی گرتەبەر. لەوێ پیاوێکی لەمناڵەکانی ئەسەد کوڕی خەزیمە بینی. بەراز پێی وت: پاداشتێکت پێ دەدەم تا بڕۆیتە لای مناڵەکانی حەرب کوڕی ئومەییە و

دواتر بڕۆیتە لای کەسەکانی من چوونکە خەڵکانی تۆن و خەڵکانی من ( چوونکە ئەسەدی کوڕی خەزیمە لە خیندەفە). ئاگاداریان بکەرەوە کەبەراز کوڕی قەیس عەروەی گەشتیاری کوشتووە. دەبێت ئەوان لەبەرابەر قەیس ئاگایان لەخۆیان بێت. بەراز بۆ ئەو پیاوە دە وشتری دیاری کرد تا بڕوات و پەیامەکەی بگەیەنێت و وشترەکان وەربگرێت. پیاوی ئەسەدی بەرێکەوت و رۆشتە عەکاز کەدەستەیەك لەخەڵکان لەوێ بوون. ئەو ڕۆشتە لای حەرب کوڕی ئومەییە و بۆی باس کرد. حەرب کوڕی ئومەییە کەسێکی بۆ لای عەبدوللە کوڕی جۆدعان تەیمی، هشام کوڕی مەغیرەی مەخزومی (باوکی ئەبوو جەهل) کە لەبەتەممنەکان و گەورەکانی قورەیش بوون، هەموو هۆزەکانی قورەیش ( کەلەهەرکام پیاوێکی بانگ کرد) و حولەیس کوڕی یەزیدی حارسی گەورەی ئەحابیش نارد و ئەوانی ئاگادار کردەوە. ئەوان بۆ راوێژ کردن کۆبوونەوە و وتیان:

دەترسین قەیسییەکان خوێنی کوژراوەکەیان لەئێمە داوا بکەن چوونکە ئەوان بەم کارە رازی نابن کە لەبەرابەرنەو پیاوێکی بەرەڵا و هەرزە لەمناڵەکانی زەمرە بکوژن. بڕیاریاندا بڕۆنە لای باوکی بەرای عامیر کوڕی مالیك کوڕی جەعفەر کوڕی کەلاب (**ملاعب الاسنه**) (ڕم باز) کە لەو کاتەدا گەورە و سەروەری قورەیش بوو و پێی بڵێن: لەنێوان نەجد و تەهامە پێشهاتێك رویداوە بێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بین. ئێستا لەناو خەڵکدا بگەرێ بۆ ئەوەی لەم کارە ئاگادار ببیتەوە.

ئەوان ڕۆشتنە لای و ئاگاداریان کردەوە. ئەو لەناو خەڵکدا گەڕا و ئەوی بەوانیان وتبوو، بە گوێی ئەوانی گەیاند. دواتر دەستەیەك لەقورەیشییەکان هەستان و وتیان ئەی خەڵکی عەکاز، لەناو خەڵکانی ئێمە لەمەککە پێشهاتێك رویداوە و ئێمە لێی ئاگادار بووینەوە. دەترسین ئەگەر لەوان دواکەوین، کارەکەمان دژوار بێت و لەخراپ خراپتر بێت. لەبەر ئەمە رۆشتنی ئێمە بەدڵ مەگرن. ئەوسا سوار هەر چاروێ و وشترێك بوون و خۆیان گەیاندە مەککەد. لەکۆتایی رۆژ ئەم هەواڵە بەعامیر کوڕی مالیك گەشت. وتی: قورەیشییەکان ناجوامێریان کرد و حەرب کوڕی ئومەییە منی هەڵخەڵەتاند. سوێند بەخوا هەرگیز کەنانە بۆ عەکاز نایێت. دواتر بەدوای ئەوان سوار بوون و ئەوانیان لەنەخلە بینی. شەڕ لەنێوان ئەو دوو دەستە دەستی پێکرد و

قەیسییەکان ئەوەندەی نەمابوو بەسەر قورەیشیەکاندا زاڵ بن. بەڵام ئەوان و پاسەوانەکانیان مەبەستی بارەگایی خواییان کرد تا لەوێ لە ئەمن و ئەماندا بن. مانەوە و شەوانە ڕۆشتنە ناو ماڵی خوایی.

پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەوان بوو. لەو کاتەدا بیست ساڵ تەمەنی بوو.

زوهری دەڵێت: پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەوان نەبوو چوونکە ئەگەر هاورێیەتی ئەوانی دەکرد، شکستیان نەدەخوارد. ئەم وتەی زوهری ڕاست نییە چوونکە پێغەمبەری خوا دوای گەشتنی وەحی و گەشتن بەپێگەی پێغەمبەری شکستی دەخوارد و هاورێکانی دەکوژران. لەبەر ئەمە ئەگەر پێش لەپێغەمبەری لەناو دەستەیەکدا بێت و شکست بخۆن، لەراستیەوە دوور نییە.

کاتێك قورەیشییەکان ڕۆشتنە ناو بارەگایی خوایی، قەیسییەکان دەستیان لێ هەڵگرتن و وتیان: ئەی قورەیشییەکان، ڕێگە نادەین خوێنی عەروە بەفیڕۆ بڕوات. شوێنی چاوپێکەوتنی ئێمە ساڵی داهاتوو لەبازاری عەکاز بێت. هەموویان گەڕانەوە بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان و بۆ عەروە گریان و یەکتریان بۆ شەڕ هاندەدا.

دواتر قەیسییەکان سوپاکەی خۆیان کۆکردەوە و سەقیف و کەسانیتر لەگەڵ ئەواندا بوون. قورەیشییەکانیش لەشکری خۆیان کۆکردەوە و هەموو کەنانە، ئەحابیش و ئەسەد کوڕی خەزیمە لەگەڵیان بوون. قورەیشییەکان کەل وپەلی شەڕیان لەناو خەڵکدا بڵاو دەکردەوە. عەبدوڵله کوڕی جودعان کەرەستەی شەڕی بەسەد کەسی بەخشی.

قورەیشییەکان ڕۆشتنە شوێنی دیاری کراو وبۆ هەرتیرەیەك لەوان فەرماندەیەك: بۆ منداڵەکانی هاشم، زوبەیر کوڕی عەبدئەلوتەلیب هاورێ لەگەڵ پێغەمبەر و براکانی ئەبو تالیب و عەباس و حەمزە کوڕەکانی عەبدئەلوتەلیب، بۆ ئومەوییەکان و هاوپەیمانەکانیان، حەرب کوڕی ئومەییە، بۆ منداڵەکانی عەبدئەلدار، عێکرەمە کوڕی هاشم کوڕی عەبد ئەلمەناف کوڕی عەبدئەلدار، بۆ منداڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدئەلعوزەی، خوەیلید کوڕی ئەسەد، بۆ منداڵەکانی مەحزوم، هێشام کوڕی موغەیرە باوکی ئەبو جەهل، بۆ منداڵەکانی تەمیم، عەبدوڵله کوڕی جودعان، بۆ منداڵەکانی جەمح، مەعمەر کوڕی حەبیب کوڕی وەهب، بۆ منداڵەکانی سەهم، عاس

كوڕی وایل، بۆ مناڵەكانی عودەی، زەید كوڕی عەمرۆ كوڕی نوفەیل باوكی سەعید كوڕی زەید، بۆ منالەكانی عامیر كوڕی لۆئەی، عەمرۆ كوڕی عەبدئەلشەمس باوكی سوهەیل كوڕی عەمرۆ، بۆ منالەكانی فێهر، عەبدوللە كوڕی جەراح باوكی عوبەیدە، بۆ ئەحابیش، حولەیس كوڕی یەزید و سوفیان كوڕی عومەیف وەك فەرماندە دیاری كرابوون. ئەحابیش ئەمانە بوون: منالەكانی حارس كوڕی عەبد مەنات كەنانە و عەزەل و قارە و دیش لەمنالەكانی هون كوڕی خەزیمە و موستەلیق كوڕی خوزاعە. لەبەر ئەوە پێیان ووتن ئەحابیش چوونكە بوونە هاوپەیمانی منالەكانی حارس. (تەحبووش) بەمانای كۆبوونەوەیە. فەرماندەی منالەكانی بەكر، بەلعا كوڕی قەیس بوو. بۆ منالەكانی فەراس كوڕی غەنەم لەكەنانە، عومەیر كوڕی قەیس كوڕی جێزەل تەعان، بۆ منالەكانی ئەسەد كوڕی خەزیمە، بیشر كوڕی ئەبی حازم و فەرماندەی هەموویان، حەرب كوڕی ئومەییە كە لەناو كوڕەكانی عەبد ئەلمەناف پێگەیەكی بەرزی و پیاوێكی بەتەمەن و بەساڵاچوبوو.

قەیسییەكان پێش لەقورەیشییەكان هاتبوونە عەكاز. فەرماندەی منالەكانی عامیر، بەرا، منالەكانی نەسر و سەعد و سەقیف، سوبەیع كوڕی رەبیع كوڕی معاویە، منالەكانی جوشەم، سەممە باوكی دوریەد، غەتەفان، عەوف كوڕی ئەبی حارسەی موڕی، منالەكانی سەلیم، عەباس كوڕی زەعل كوڕی هەنی كوڕی ئەنس، فەرماندەی فەهم و عەدوان، كودام كوڕی عەمرۆ بوون.

قورەیشیەكان بەرەو عەكاز بەرێكەوتن و لەوێ دابەزین. قەیسییەكان لەوێ بوون. براكانی سوفیان و ئەبو سوفیان و عاس و باوكی عاس، منالەكانی ئومەیە لەگەڵ حەرب كوڕی ئومەییەدا بوون. حەرب خۆی بەست (بەوشێوەی نەتوانێت هەڵبێت) و باوكی ئعاس و سوفیان خۆیان بەستەوە و وتیان: هیچ كام لەپیاوانی ئێمە لەشوێنی خۆی ناجوڵێت تا بمرێت یا سەردەكەوێت. لەبەر ئەمە ئەوانیان بە(عنابس) (شێرەكان) ناوبرد. عنبس بەمانای شێرە. شەڕێكی قورس دەستی پێكرد كە لەسەرەتای نیمەڕۆ سەركەوتنی قەیسییەكانی بەدواوە بوو و زۆربەی كەنانییەكان و قورەیشییەكان شكستیان خوارد. منالەكانی عودەی و منالەكانی زوهرە هەلاتن و مەعمێر كوڕی حەبیبی جومەحی كوژرا و ژمارەیەك لەمنالەكانی

فەراسیش هەلاتن. حەرب کوڕی ئومەییە، منالەکانی عەبد شەمس و هۆزەکانیتری قورەیش خۆراگریان کرد. سەرکەوتن تا نیمەڕۆ بۆ قەیسییەکان و زیان لەبەرژەوەندی قورەیشییەکاندا بوو. دواتر قورەیش و کەنانە سەرکەوتن و زۆر لەقەیسییەکانیان کوشت. شەڕەکە زیاتر گەرم و سەخت بوو. لەم ڕۆژەدا لەژێر ئالای منالەکانی حارس کوڕی عەبدمەنات کوڕی کەنانە زیاتر لەسەد پیاوی شەڕکەر کوژران کەهەموویان خۆراگریان کرد. قەیسییەکان شکستیان خوارد و عەباس کوڕی عەلی سولەمی لەگەورەکانی ئەوان هاوڕێ لەگەڵ کەسانیتر کوژران. کاتێك باوکی سەیید مامی مالیك کوڕی عەوف نەسری بینی خەلکی کەنانە چۆن کوشتار دەکەن، هاواری کرد: ئەی منالەکانی کەنانە، لەکوشتنی خەلك لەئەندازە تێپەرین. کوڕی جودعان وتی: ئێمە خەلکانێکین لەئەندازە تێدەپەڕین.

کاتێك سوبەیع کوڕی رەبیع کوڕی معاویە شکان و هەلاتنی هۆزەکانی قەیسی بینی، خۆی بەستەوە و لەسەر زەوی خەوت و وتی: ئەی خەلکی منالەکانی نەسەر، پارێزگاری و چاودێریم بکەن یا لەحالی خۆمدا بەجێمبێلن وبڕۆن. لەم کاتەدا منالەکانی نەسر و جەشە و سەعد کوڕی بەکر و فەهم و عەدەوان دەوریان گرت و هۆزەکانیتری قەیس هەلاتن. ئەوسا هەر دوو لای شەڕ داوای ئاشتیان کرد. لەسەر ئەم بنەمایە ئاشتیان کرد کەکوژراوەکانی هەردوولا بژمێرن و هەرکام کوژراوی زیاتریان بێت، خوێنبایی خۆیان لەلاکەیتر وەربگرن. بینیان قورەیشییەکان و کەنانییەکان بیست کەسیان زیاتر کوشتووە. لەم ڕۆژەدا حەرب کوڕی ئومەییە کوڕەکەی خۆی یانی ئەبوسوفیانی لەبەرابەرخوێنبایی وەك بارمەتە لای ئەوان دانا. گەورەکانی دیکەیش هەرکەسەو بارمتەیەکی دانا. خەلك لەروبەڕووبوونەوەی یەك دەستیان هەلگرت وئاگری شەڕیان دامرکاند و ئەو دوژمنایەتی و رقەیان لەیەکتر بەئاوی ئاشتی شۆردەوە و پەیمانیاندا ئازاری یەکتر نەدەن و کاری بەراز و کوژرانی عەروەی گەشتیار لەبیر بکەن.

## شەڕی زونەحەب

داستانی شەڕی زونەحەب بەو شێوە بوو کاتێك منالّەکانی عامیر لەشەڕی جەبەلە زیانیان بەمنالّەکانی تەمیم گەیاند، ئارەزویان کرد بەتەواوی لەناو ببەن. لەبەر ئەمە بۆحەسان کوڕی کەبشەی کێندی، یەکێك لەپاشاکانی کیندە، نامەیان نوسی. ناوی ئەو حەسان کوڕی معاویە کوڕی حوجر بوو. داوایان لێکرد هاوڕێ لەگەڵ ئەوان برواتە شەڕی لقی منالّەکانی حەنزەلە لەهۆزی منالّەکانی تەمیم. ئاگاداریان کردەوە کەسوارکاران و دلێرەکان و گەورەکانی ئەوانیان کوشتووە. حەسان کوڕی معاویە هاوڕێ لەگەڵ پیاوانی شەڕکەر و دەست پەروەردە و هاوەڵانی خۆی هاتە لای منالّەکانی عامیر. کاتێك هەواڵی بەرێکەوتنی ئەوان بەگوێ منالّەکانی حەنزەلە گەشت، عەمرۆ کوڕی عەمرۆ پێی وتن: ئەی منالّەکانی مالیك ئێوە توانایی خۆڕاگری لەبەردەم ئەم پاشا و سوپا بێ ئەژمارەکەیتان نییە. رێگە چارە ئەومیە لەنشینگەکانی خۆتان کۆچ بکەن. ئەوان لەسەرەوەی دۆڵ، روبەروی ئەو شوێنە بوون کەدوژمنان لەوێوە دەهاتن. منالّەکانی مالیك لەشوێنەکانی خۆیان هەستان و بەرێکەوتن و لەپشت سەری منالّەکانی یەربوع دابەزین ومنالّەکانی یەربوع روبەروی دوژمن و سوپای پاشا بوونەوە.

کاتێك بینیان منالّەکانی مالیك ئەم رێگە چارەیان هەڵبژاردووە، ئامادەی شەڕ بوون و روبەروی پاشا بوونەوە. کوڕی کەبشە لەکاتی بەرەبەیاندا گەشت و بینی دوژمن ئامادەی شەڕە. شەڕێکی قورس رویدا. منالّەکانی مالیك بینیان منالّەکانی یەربوع ئازایانە شەڕ و خۆڕاگری دەکەن، رۆشتنە پاڵیان و دەستیان بەشەڕ کرد. حوشەیش کوڕی نێمرانی ریاحی زەربەیەکی لەسەری کوڕی کەبشەی پاشادا و ئەوی خستەسەر زەوی. ئەو لەخوێنی خۆیدا تلاّیەوە ومرد. عوبەیدە کوڕی مالیك کوڕی جەعفەریش کوژرا و توفەیل کوڕی مالیك سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی (قۆرزۆڵ) هەلاّت. عەمرۆ کوڕی ئەحوس کوڕی جەعفەریش کەگەورە و سەرکردەی منالّەکانی عامیر بوو، کوژرا. منالّەکانی عامیر و دەست پەروەردەکانی کوڕی کەبشە شکستیان

خوارد. جەریر کە لەرۆژگاری ئیسلامیدا بوو، ئاماژەی بەو روداوە داوە و دەڵێت:

بذی نجب ذدنا و اکل مالك اخا لم یکن عند الطعان بوواکل

واتاکەی: ئێمە لەشەڕی زونەحەب بەرگری و خۆراگریمان کرد بەڵام مناڵەکانی مالیك برایەکیان بەتەنیا جێهێشت کەهیچ کات لەکاتی دەرکێشانی شمشێر و وەشاندنی ڕم دەستی لەهاوکاری هاورێکانی خۆی هەڵنەدگرت.

## شەڕی نەعفی قوشارە

ئەمە ئەو شەڕە بوو سەرکەوتنی شەیبانییەکان بەسەر تەمیمیەکانی لێکەوتەوە.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: بێستام کوڕی قەیس هێرشی کردە سەر مناڵەکانی یەربوع لەتەمیمیەکان و ئەمە لەکاتێکدا بوو ئەوان لەشوێنێك بەناوی نەعفی قوشارەدا بوون. ئەو لەکاتی نیمەڕۆدا گەشت، هەوا هەوری و تۆفانی بوو. ئەو روبەروی گایەلی چوارپێکان بوویەوە کەبۆ لەوەڕین بەرەلایان کردبوون. هەموویانی کۆکردەوە و پێش خۆیدا وبەرەو لای خەڵك و ماڵی خۆی گەڕایەوە. مناڵەکانی یەربوع بۆ شوێنکەوتنی هانی یەکیتریاندا و خۆیان پێ گەیاند. لەم کاتەدا عومارە کوڕی عوتەیبە کوڕی حارس کوڕی شیهاب لەناویاندا بوو. بێستام هێرشی کردە سەری و کوشتی. مالیك کوڕی حیتانی یەربوعی بۆ هاوکاری کردنی هات بەڵام بێستام ئەویشی کوشت. هەروەها بوجەیر کوڕی باوکی مولەیل هەنگاوی بردە پێش و ئەویش لەسەر دەستی بیستام کوژرا. ئەوان دەستەیەکیان لەمناڵەکانی یەربوع کوشت و ژمارەیەکیان بەدیلی گرت. یەکێك لەدیلەکان مولەیل کوڕی باوکی مولەیل بوو. ئەوان بەدەستی پڕ و تەندروست بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان گەڕانەوە. لەم ناوەدا یەکێك لەدیلەکان روی کردە بێستام و وتی: ئایا دەتەوێت لەجیاتی من باوکی مولەیل دیلی تۆبێت؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەگەر ئەوت نیشان بدەم هەر ئێستا ئازادم

دەکەیت؟ بێستام وتی: بەڵێ. پیاو وتی: کوڕەکەی بووجەیر ئازیزترینی خەڵکی سەر زەوی بۆ ئەو بوو. هەر ئێستا لەگۆڕەپانی شەڕ دەیدۆزیتەوە کە کەوتۆتە سەر جەنازەی کوڕەکەی و ماچی دەکات. ئەو بەدیلی بگرە. بێستام گەڕایەوە و ئەوی لەو حاڵەدا بینی. ئەوی گرت وپیاوی یەربوعی ئازاد کرد. باوکی مولەیل پێی وت: بووجەیرت کوشت و من و کوڕەکەم یانی مولەیلت ئەسیر کرد! سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی دیل بم دەم بۆ خواردەمەنی نابەم. بێستام ترسا بمرێت. لەبەر ئەمە بێ وەرگرتنی بەهای ئازادی، ئازادی کرد. بەڵام پەیمانی لێسەند کەبەهای ئازادی کوڕەکەی مولەیل بدات و بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی کوڕەکەی شوێنی نەکەوێت و زمان بۆ ئاژاوەنانەوە نەکاتەوە و کەسانێتر بۆ شوێنەکانی ئەو و شوێنە هەستیارەکانی ئەو یا ژن و منالەکان و سامانەکانی ڕێنوێنی نەکات و هیچ کات هێرش نەکات سەر خۆی و خەڵکەکەی. ئەو بۆ هەموو ئەم کارانە لەباوکی مولەیل پەیمانی وەرگرت. بێستام قژی ناوچاوانی بڕی و ئازادی کرد. باوکی مولەیل بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە و ویستی پەیمانەکەی لەگەڵ بێستام بشکێنێت و زیانی لێبدات. هەندێ لەپیاوانی منالەکانی یەربوع ئەم هەواڵەیان بەگوێی بێستام گەیاند. ئەو باوکی مولەیلی ئاگادار کردەوە. موتەممەم کوڕی نوەیرە لەمبارەوە وتی:

ابلغ شهاب بنی بکر وسیدها — عنی بذاك ابا الصهبا بسطاما

اروی الاسنة من قومی فانهلها — فاصبحوا فی بقیع الارض نواما

لایطبقون اذاهب النیام ولا — فی مرقد یحلمون الدهر احلاما

اشجی تمیم بن مر لا مکایدة — حتی استعادوا له اسری و انعاما

هلا اسیرا فدتك النفس تطعمه — مما اراد و قدما کنت مطعاما

واتاکەی: بۆ ئەستێرەی منالەکانی بەکر و سەروەری ئەوان باوکی سەهبا بێستام لەمنەوە پەیامێك بنێرە. ڕمەکانم لەخوێنی خەڵکی خۆم تێراو کرد بەشێوەیەك لەسەوزەلانێك لەسەر زەوی خەوێکی هەمیشەییان لێکەوت. کاتێك خەوتووان بەئاگا بێنەوە، ئەوان پێڵو ناتروکێنن و لەئارامگاکەی خۆیان ناجوڵێن و تا کۆتایی ڕۆژگار

هیچ خەوێك نابینن. تەمیم کوڕی موڕی تەمیمی نە بەفێڵ کەبەزۆری بازو هانیدا بەشێوەیەك هەموویان بوونە دیل و بەندە و چاروێی ئەو. گیانم فیدای تۆبێت! بۆ بەیەکێك لەم ئەسیرانە لەوەی دەیویست، خواردنت نەدا؟ تۆ بەردەوام لەسەراسەری ژیانت ڕێزی میوانت گرتووە و ڕۆژی دەر بوویت.

## شەڕی غەبیت

ئەم شەڕە لەنێوان شەیبانییەکان و تەمیمیەکان رویدا و بێستام کوڕی قەیسی شەیبانی ئەسیر کرا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو بێستام کوڕی قەیس وحەوفەزان کوڕی شەریك و مەفروق کوڕی عەمرۆ هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەمناڵەکانی شەیبان هێرشیان کردە سەر مناڵەکانی تەمیم و پەلاماری سەعلەبە کوڕی یەربوع و سەعلەبە کوڕی زەببە و سەعلەبە کوڕی عودەی کوڕی فەزارە و سەعلەبە کوڕی زەمبیانیان دا. ئەمانە لەبیابانی (فەلەج) هاوسێی یەکتر بوون. سەعلەبیەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەوان کوژرا و مناڵەکانی شەیبان سامانەکانی ئەوانیان تالآن کرد. تالآنیکەران لەسەر ڕێگای خۆیان لای مناڵەکانی مالیك کوڕی حەنزەلە تێپەرین کە لە مناڵەکانی تەمیم بوون و لەبیابانی فەلەج و غەبیت ئەلودەرە دەژیان. وشترەکانی ئەوانیان کۆکردەوە و لەگەڵ خۆیان بردیان. لەملاوە یەربوعییەکان سوار بوون و شوێنیان کەوتن. لەناو ئەوان ئەتوانین ئاماژە بەم کەسانە بدەین: مناڵەکانی مالیك بەسەرکردایەتی عوتەیبە کوڕی حارس کوڕی شەهابی یەربوعی و سوارکارانی مناڵەکانی یەربوع کەهەموویان شوێن مناڵەکانی شەیبان کەوتن. هاورێ لەگەڵ ئەوان گەورەکانی تەمیم دەبینران: ئوحەیمێر کوڕی عەبدوللە، ئۆسید کوڕی جەبات، حوڕ کوڕی سەعد و مالیك کوڕی نەویرە. ئەوان تالآنکەرانیان لەغەبیت ئەلودەرە بینی و شەڕیان لەگەڵ کردن. هەردولای شەڕ خۆراگریان کرد. مناڵەکانی شەیبان شکستیان خوارد ومناڵەکانی تەمیم چوارپێکان و سامانە تالآن کراوەکانی خۆیان

وەرگرتەوە. منداڵەکانی شەیبان، باوکی مەرحێب رەبیعە کوڕی حەسییەیان کوشت و عوتەیبە کوڕی حارس بەدژواری و پێداگرتن هێرشی کردە سەر بێستام کوڕی قەیس و ئەوی گرت وپێی وت: ئەی باوکی سەهبا، بەئەسیری رازی ببە چوونکە بۆ تۆ باشترم لەتینویەتی و بیابان. بێستام کوڕی قەیس خۆی تەسلیم کرد. منداڵەکانی سەعلەبە بەعوتەیبە کوڕی حارسیان وت: باوکی مەرحێب کوژرا و بێستام کوڕی قەیس، کوژەری مولەیل و بوجەیر و کوڕانی باوکی مولەیل و مالیك کوڕی حەتان و کەسانیتر، بەدیلی گیرا، بیکوژە. وتی: پیاوێکی خێزاندارم و شیرم دەوێت. وتیان: بەهای ئازادی لێ وەردەگریت و ئازادی دەکەیت و ئەو دەگەڕێتەوە و دەست بەکوشتاری ئێمە دەکاتەوە و سامانەکانمان تالان دەکات. ئەو بەکوشتنی بێستام رازی نەبوو، هەڵی گرت و بردییە ناو منداڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە تا کەس نەیگرێت و بیکوژێت. لەبەر ئەوە مەبەستی عامرییەکانی کرد کەپوری خولە کچی شیهاب هاوسەری یەکێك لەپیاوەکانی ئەو هۆزە بوو. مالیك کوڕی نەویرە لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| و لله عتاب بن مية اذرأى | الى ثارنا فة كفه يتلدد |
| ا تحيى امرا اروى بجيرا و مالكا | و اتوى حريثا بعد ماكان يقصد |
| و نحن ثارنا قبل ذاك ابن امه | غداة الكلابيين و الجمع يشهد |

واتاکەی: خوا فریایی عیتاب کوڕی نومەییە بکەوێت کاتێك سەیری پیاوی خوێناوی ئێمەی دەکرد کە لەناو دوو دەستەکەی سەرگەردان بوو. ئایا پیاوێك بەزیندویی دەهێڵێتەوە کەبوجەیر و مالیکی کوشت و حەریسی لەناو برد کەمەبەستی ژیانی لەسەردابوو؟ ئێمە پێشتر کوڕی دایکی ئەومان جەرگبڕاو کرد و ئەمە لەکاتی بەرەبەیانی کەلابیەکان بوو کەژمارەیەکی زۆر بۆ سەیر کردن هاتبوون.

کاتێك عوتەیبە کوڕی حارس گەشتە ناو ماڵی عامرییەکان، بێستام قیژاندی: ئای شەیبانیان! بەڵام ئێستا هۆزێك بەناوی شەیبان بۆ من نەماوە! بەدوای ئەمە هاواری دادخوازییە، عامیر کوڕی توفەیل کەسی بۆ لای بێستام نارد و پەیامی دا: ئەگەر نەتوانی خۆت بگەیێنەرە خێوەتەکەی من تا پەنات بدەم و لەزیانەکان دوورت

بکەمەوە. ئەگەر ناتوانی، خۆت بخەرە ناو چاڵی ئاوەکان (ئەگەر هەیە بۆ ئەوەی لەناو چاڵەکان تێپەرێت و خۆی بەدەرەوە بگەیێنێت). تابیعەی (عەرەبەکان گومانیان دەکرد هەندێ لەکەسانی بیرتیژ کە کاری وشیارانە دەکەن، هاورێی پەرییان هەیە. ئەم پەرییانەیان بەتابیعەی ئەو کەسە ناو دەبرد). جنۆکەی عوتەیبە کوڕی حارس هاتە لای وئاگاداری کردەوە. ئەو فەرمانی دا و ماڵەکەیان وێران کرد. ئەوسا جل وبەرگی شەڕی لەبەر کرد و کەرەستەی شەڕی هەڵگرت و سوار لەسەر ئەسپەکەی ڕۆشتە ناو کۆڕی مناڵەکانی جەعفەر کەعامیر کوڕی توفەیلی غەنەوی لەوێ بوو. سڵاوی کرد و دواتر بەعامیری وت: ئەی عامیر لەپەیامەکەی تۆ بۆ بێستام ئاگادار بوومەوە. ئێستا تۆ لەبەردەم سێ هەڵبژاردندا ئازاد دەکەم. عامر وتی: چین؟ عوتەیبە کوڕی حارس وتی: یەکەم ئەوەی ئەگەر بتەوێت ناونیشانی بنەماڵەکەی خۆت بەمن بدەیت تا ئازادی بکەم چوونکە ناونیشانی بنەماڵەکەی تۆکەمتر لەو نییە. عامیر وتی: هیچ ڕێگایەك بۆ ئەم کارە نییە. عوتەیبە وتی: خۆت بخەرە شوێنی ئەو ( یانی لەجیاتی ئەو خۆت بکەرە دیلی من) چوونکە بەباوەڕی من تۆ کەم بەهاتر لەوونیت. عامر وتی: ئەم کارەیش ناکەم. عوتەیبە وتی: هاورێ لەگەڵ من وەرە تا کاتێك لەم تەپۆڵکەیە تێپەڕمان کرد لەسەر ئەو، تا دوا هەناسە شەڕ بکەین. عامر وتی: زیاتر لەهەموان ڕقم لەم کارەیە. عوتەیبە (بێستامی) هەڵگرت و بەرەو مناڵەکانی عوبەید کوڕی سەعلەبە بردی. بێستام وشتری دایکی عوتەیبەی بینی و لەکەژاوەکەی لاواز و ژاکاوەکەی روانی. وتی: ئەی عوتەیبە، ئایا ئەمە کەژاوەی دایکی تۆیە بەمشێوەیە ژاکاوە؟ عوتەیبە وتی: بەڵێ. بێستام وتی: سوێند بەخوا کەژاوەی دایکی هیچ سەرورەرێکم بەمشێوە ژاکاوە نەبینیوە. عوتەیبە وتی: سوێند بەلات و مەنات تۆ ئازاد ناکەم تا دایکت کەژاوەکەی خۆی بۆ من دێنێت. کەژاوەکەی ئەو زیاد لەرادە گەورە و گرانبایی بوو. ئەمە ئەو شتە بوو بێستام دەیویست عوتەیبەی پێ تەماحکار بکات بۆ ئەوەی نەیکوژێت. بێستام کەسی نارد و کەژاوەی دایکی هێنا و خۆی بەدانی چوارسەد ( و بەوتەی هەندێ کەس هەزار ) وشتر و سی ئەسپ و ساز و بەرگ و کەژاوەکەی دایکی، ئازاد کرد. کاتێك رزگاری بوو، سیخوڕی بۆ عوتەیبە کوڕی حارس دانا تا چاودێری وشترەکانی بکەن و ئاگاداری

بکەنەوە. سیخوڕەکان هەواڵیان هێنا کە وشترەکانی لە(ئەرباب)ن. هێرشی کردە سەریان و هەموو وشتر و سامانەکانی وەرگرتەوە.

## شەڕی شەیبانیان لەگەڵ تەمیمیەکان

باوکی عوبەیدە دەڵێت: ئەقرەعی کوڕی حابس و براکەی فێراس لەمناڵەکانی تەمیم کەهەردووکیان کەچەڵ بوون، هاوڕێ لەگەڵ مناڵەکانی موجاشع لەهۆزی تەمیم بەرێکەوتن تا هێرش بکەنە سەر هۆزی بەکر کوڕی وایل و تالآنیان بکەن. باوکی جۆعەل لەگەڵیاندا بوو. بێستام کوڕی قەیس شەیبانی و عیمران کوڕی مورە هاوڕێ لەگەڵ مناڵەکانی بەکر کوڕی وایل لەشوێنێك بەناوی (زوباله) روبەرویان بوونەوە و شەڕێکی سەخت دەستپێکرد کەبەکرییەکان سەرکەوتن و تەمیمەکان شکستیان خوارد و دوو(ئەقرەع) دوو کەچەڵ و باوکی جۆعەل و کەسانی زۆر ئەسیر کران. دوو ئەقرەع خۆیان لەبێستام کڕییەوە و سوێندیان خوارد بەهای ئازادی بدەن. بێستام ئەوانی ئازاد کرد بەڵام ئەوان دور کەوتنەوە و هیچیان نەنارد. لەناو ئەسیرەکان پیاوێك لەیەربوعیەکان دەبینرا. شەوێك بێستام کوڕی قەیس ئاوازی ئەوی بیست کەدەیوت:

| | |
|---|---|
| فدى بووالدة على شفيقة | فكانها حرض على الاسقام |
| لو انها علمت فيسكن جاشها | انى سقطت على الفتى المطعام |
| ان الذى ترجين ثم ايابه | سقط العشاء على بسطام |
| سقط العشاء على متنعم | سمح اليدين معاود الاقدام |

واتاکەی: گیانم فیدایی دایکم بێت کە لەگەڵم مێهرەبانە و دەڵێی لەناو خەمەکان لەلێدان کەوتووە. خۆزگە دەیزانی (و پەرێشانیەکەی ئارام دەبوویەوە) کەمن لەدەست پیاوێکی میواندار دیلم. ئەو کەسەی لەوێ چاوەڕێی گەرانەوەی دەکەیت، لەکاتی ئێوارێ بەدەست بێستام ئەسیر بووە. لەکاتی ئێوارێ کەوتۆتە دەست

پیاوێکی بەتوانا و بەخشەندە کەدەستەکانی بەخشندەیە و بەهەنگاوی بەهێز کاروبارەکان دەباتە پێش.

کاتێك بێستام ئەم قسانەی بیست، وتی: بەگیانی باوکت کەس جگە لەخۆت ئەم هەواڵە بەدایکت نادات. بێستام ئازادی کرد: کوڕی رەمیزی عەنزی دەڵێت:

جاءت هدايا من الرحمان مرسلة حتى انيخت لدى ابيات بسطام
جيش الهذيل و جيش الاقرعين معا و كبة الخيل و الاذواد فى عام
مسوم خيله تعدو مقانبه على الذوائب من اولاد همام

واتاکەی: دیاری نێردراوەکان لەلایەن خوای مێهرەبانەوە گەشتنە بەردەم ماڵەکانی بێستام. سوپاییەکانی هوزەیل و سوپایەکانی دوو ئەقرەع پێکەوە، و ئەسپەکان بەباری گران و مەڕومالآتی زۆر لەیەك ساڵ کەران تا کەران. ئەسپەکانی بەساز وبەرگەوە و لەلەوەڕگاکان بەرەلآ کراون و قەڵەون و چوارپێیانەیی تالآنی کردووە، بەخێرایی بۆ لای پیاوە پایەبەرزەکان لەمناڵەکانی هەمام نێردران.

ئەوس کوڕی حەجەر وتی:

و صبحنا عار طويل بناءه نسب به مالاح فى الافق كوكب
فلم اريوما كان اكثر باكيا و وجها ترى فيه الكآبة تجنب
اصابوو البروك و ابن حابس عنوة فظل لهم بالقاع يوم عصبصب
و ان ابا الصباء فى دومة الوغى اذا ازورت الابطال ليث كجرب

واتاکەی: شەرمێکی بالآ بەرز کەوتە سەرمان کەبینایەکی بەرزی هەیە و بەدوای ئەوە بەردەوام تا ئەو کاتەی ئەستێرەیەك لەقەراغەکانی ئاسمان بدرەوشێتەوە، جنێومان پێ دەدات. رۆژێکم نەبینی کەخەڵکان زیاتر لەو رۆژە چاو بەگریان بن و روخسارێك کەپەرێشانی لێدەخوێندرێتەوە. بروك و کوڕی حابسیان بەزۆر گرت و ئەمانە لەدەشت، رۆژێکی سەختیان بەسەر برد. باوکی سەهبا لەگەرماوگەرمی

شەڕەکە، ئەوساتەی پاڵەوانەکان خۆیان لەشەڕ بەدوور دەگرن، شێرە پیاوێکی بەئەزمونە.

باوکی سەهبا هەمان بێستام کوڕی قەیسە. وتاردەران سەبارەت بەم رۆژە قەسیدەی دور و درێژیان لەوەسفی بێستامدا نوسیوە کەئێمە بۆ کورت کردنەوەی قسە، ئاماژەمان پێنەدان.

## شەڕی مەبایز

ئەم شەڕە سەرکەوتنی شەیبانییەکان و شکست خواردنی تەمیمیەکانی لێکەوتەوە.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: ساڵێك تەریف کوڕی تەمیمی عەنبەری تەمیمی حەجی کرد. ئەو پیاوێکی چوارشانە بوو کە بە(موجەدەع) ناودەبرا. شاسواری خەڵکەکەی بوو. رۆژێك کەتەریف بەدەوری ماڵی خوادا دەسورایەوە، حەمسیسە کوڕی جەندەلی شەیبانی لەمناڵەکانی رەبیعە کەلاوێکی بەهێز و بوێربوو، چاوی پێی کەوت و ماوەیەکی زۆر لێی روانی. تەریف پێی وت: بۆ بەم شێوە سەیرم دەکەیت؟ حەمسیسە وتی: دەمەوێت نیشانەکانی تۆ بەباشی بەمێشك بسپێرم ئەگەری هەیە رۆژێك لەناو دەستەیەك سوپا بتبینم و بتکوژم. تەریف سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: خواوەندا ساڵ مەسوڕێنە تا چاوم بەو دەکەوێت. حەمسیسەیش بەهەمان شێوە لەخوا پاڕایەوە. تەریف وتی:

او کلما وردت عکاظ قبیلة — بعثوا الی عریفهم یتوسم
لا تنکرونی اننی انا ذاکم — شاکی السلاح و فی الحوادث معلم
حولی فوارس من اسید جمة — و من الهجیم و حول بیتی خصم
تحتی الاغر و فوق جلدی نثرة — زغف ترد السیف و هو مثلم

واتاکەی: ئایا هەرجار کەهۆزێك دێتە عەکاز، روخسارناسانی خۆی بۆ لای من دەنێرێت تا بەدوای نیشانەکانی مندا بگەرێت؟ من بەنەناسراو مەزانن، ئەو کەسەم کەدەزانن. سەرتاپێ لەناو کەرەستەکانی شەڕدام و لەشەڕەکان پێشڕەو و کارزان و ناسراوم. لەدەوری من شاسوارانێکی زۆر لەهۆزی ئەسید کۆبوونەتەوە، پیاوانێك لەهوجەیم و دەوروبەری ماڵەکەی منیان گرتووە. لەژێر پێی من ئەسپێکی ناچاو سپیە و لەسەر پێستەکەم زرێیەکی ئەستور و بەهێز و بڵند کەشمشێر کاری لێناکات و دەگەڕێتەوە.

ئەم قەسیدەیە بەیتی دیکەیشی هەیە.

بەرێکەوت مناڵەکانی ئەبی رەبیعە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان و مناڵەکانی مورە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان شەڕ و ئاژاوە کەوتە ناویان و شەڕێکی کورت خایەن رویدا. لەم شەڕەدا خوێن نەرژا. هانی کوڕی مەسعود سەرومەری مناڵەکانی ئەبی رەبیعە بەخەڵکەکەی وت: حەز ناکەم ئاژاوە لەناو ئێمەدا پەرە بستێنێت. کۆچی بەوان کرد و لەسەر ئاوێك بەناوی مەبایز نیشتەجێی کردن. ئەم ئاوە لەنزیکی ئاوەکانی مناڵەکانی تەمیم بوو. بۆ مانگێك لەوێ مانەوە و هەواڵی هاتنیان بەگوێی تەمیمیەکان گەشت. ئەوان بۆ یەك پەیك و تەتەریان نارد و وتیان: ئەوان هۆزێکی تەك و تەنیان. ئەگەر ئەوان لەناو ببەن، بەکر کوڕی وایلتان سست و لاواز کردووە. ئەوان کۆبوونەوە و سییان فەرماندەیی ئەوانیان گرتەدەست: باوکی جەدعای تەهەوی فەرماندەی مناڵەکانی حەنزەلە، کوڕی فەدکەی مێنقەری فەرماندەی مناڵەکانی سەعد و تەریف کوڕی تەمیم فەرماندەی مناڵەکانی عەمرۆ و مناڵەکانی تەمیم. کاتێك گەشتنە نزیك مناڵەکانی ئەبی رەبیعە، ئەوان ئاگادار بوونەوە و بۆ شەڕخۆیان ئامادە کرد. هانی کوڕی مەسعود قسەی بۆ کردن و ئەوانی بۆ شەڕ هاندا. وتی: کاتێك هاتن بۆ ماوەیەك شەڕیان لەگەڵ بکەن و دواتر پشتیان تێبکەن و کاتێك سەرقاڵی تالآنی بوون، هێرشیان بکەنەسەر و خوێنیان برێژن ودڵی خۆتان فێنك بکەنەوە تا سەرکەوتن بەدەست بێنن.

تەمیمیەکان لەکاتی بەرەبەیان هێرشیان کردە سەریان و ئەمان ئامادەی شەڕ بوون. هەردوولای شەڕکەر بەسەختی شەڕیان کرد و منالەکانی شەیبان ئەو کارەیان کرد کەهانی فەرمانی پێدابوون: منالەکانی تەمیم سەرقالی تالانی بوون. یەکێك لەوان لای منالێك لەهانی کوڕی مەسعود تێپەڕی و وتی: ئەمە بۆ من بەسە. ئەو منالەکەی هەلگرت و ئەسیری کرد. تەمیمییەکان لەگەلّ دیلەکان و تالانییەکان مانەوە. منالەکانی شەیبان گەڕانەوە و ئەوانیان شکستدا و کوشتاریان کردن و ئەسیریان گرت و هەر کارێك ویستیان، کردیان. تەمیمیەکان شکستێکی لەوچەشنەیان ئەزمون نەکردبوو، کەمێك لەوان بەسلامەتی رزگاری بوو. کەس هاوکاری کەسی نەکرد. تەریف هەلاّت وحەمسیسە شوێنی کەوت، گرتی و کوشتی. شەیبانییەکان ئەسیر و تالانییەکانی خۆیان وەرگرتەوە و زیادە لەوە سامانی تەمیمیەکانیان تالاّن کرد و زۆر لەوانیان گرفتار کرد. هانی کوڕی مەسعود سەد وشتری وەك بەهای ئازادی کوڕەکەی دا و وەریگرتەوە. یەکێك لەشەیبانییەکان سەبارەت بەم رۆژە وتویەتی:

و لقد دعوت طريف دعوة جاهل — غر و انت بمنظر لا تعلم
و اتيت حيا فى الحروب محلهم — و الجيش باسم ابيهم يستهزم
فوجدتهم يرعون حول ديارهم — بسلا اذا حام الفوارس اقدموا
و اذا اعتزوا بابى ربيعة اقبلوا — بكتيبة مثل النجوم تلملم
ساموك درعك و الا غر كليهما — و بنو اسيدا سلموك و خصم

واتاکەی: تەریفت بانگ کرد، بانگ کردنی نەزانێکی هەلّخەلّەتاو، تۆ لەدیدگا بوویت و نەت دەزانی. لەچەندین شەڕ لەجێگەی هۆزێك شەڕی ئەوانت کرد و سوپا بەناوی باوکی خۆی بەشێوەیەك نیشاندا کەشکستی خواردووە. ئەوانت بینی کەرێزی مالەکانی خۆیان دەگرن، خەلکانێکی بوێرن، کاتێك سوارەکان سەرگەرمی شەڕن، هەنگاو دەبەنە پێش، کاتێك بەئەبی رەبیعە پشت ئەستور بن، لەگەلّ سوپایەك بەئەندازەی ئەستێرەکان کۆدەبنەوە و روو لەدوژمن دەکەن. زرێ و ئەسپە ناوچاو

سپیەکەتیان لێ سەندی و منداڵەکانی ئەسید، هەموو دۆست و هاوڕێیانی تۆیان بۆ دوژمن بەجێهێشت.

عەمرۆ کوڕی سەواد بۆ مەرگی تەریف ئەم شێعرەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| لا تبعدن یا خیر عةمرو بن جندب | لعمری لمن زار القبوور لیبعدا |
| عظیم رماد النار لا متعبسا | و لا مویسا منها اذا هو اوقدا |
| و ما کان وقافا اذا الخیل احجمت | و ما کان مبطانا اذا ما تجردا |

واتاکەی: ئەی باشترین منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی جوندەب، دوور مەبە، بەڵام بەگیانی خۆم سوێند هەرکەس بەرەو گۆڕ بڕوات دوور دەکەوێت، ئاگری زۆرت هەڵدەگیرساند و خۆڵەمێشی زۆرت بەجێدەهێشت (چوونکە میوانی زۆرت بوو) نەروت گرژ دەکرد ونەکەست لەئاگرەکەی خۆت بێ هیوا دەکرد، کاتێك ئاگرت دەئایساند. کاتێك ئەسپەکان درەنگیان دەکرد لەشوێنی خۆت نەدەچەقایی و کاتێت تەنیا دەبوویت، ورگ پەرەست نەبوویت.

## شەڕی زویرەین

باوکی عوبەیدە دەڵێت: سەرزەمینی بەکر کوڕی وایل گیرۆدەی وشکەساڵی بوو و ئەوان بۆ ئاو و لەوەڕگا رویان لەسەرزەمینی تەمیمییەکان لەنێوان هیجر و یەمامە کرد. کاتێك نزیك بوونەوە، هەر پیاوێکی بەکری کەتەمیمییەکی دەدی، دەیکوشت و هەرتەمیمییەك کەپیاوێکی بەکری دەبینی، لەناو خوێنی خۆیدا دەیگەوزاند. هەر کام سامانی ئەویتری دەرفاند. زیان لەناو پەرەی سەند و بارودۆخیان دژوار بوو. لەم کاتەدا، حەوفزان کوڕی شەریك و وادك کوڕی حارس (هەردوك شەیبانی ) هاتنەدەر تا هێرش بکەنە سەر مناڵەکانی دارم. پێشهاتەکە وابوو کەلەم کاتەدا تەمیمییەك لەگەڵ دەستەیەکی زۆر لەهۆزی عەمرۆ کوڕی حەنزەلە، رەباب، سەعد و کەسانیتر کۆبوونەوە و بەرەو هۆزی بەکر کوڕی وایل غاریاندا. فەرماندەی تەمیم باوکی رەئیسی حەزنەلی بوو. ئەم هەواڵە بەهۆزی بەکر کوڕی وایل گەشت. ئەوانیش رویان تێکرد و فەرماندەیی ئەوان لەدەست ئەم کەسانەدا بوو: ئەسەم، عەمرۆ کوڕی قەیس کوڕی مەسعود باوکی مەفروق، حەنزەلە کوڕی سیاری عێجلی، حومران کوڕی عەبد عەمرۆی عەبەسی و کەسانیتر. کاتێك دوی لای شەڕ جەنگیان دەستپێکرد، تەمیمییەکان و رەبابییەکان دوو وشتریان رازاندەوە و چەندین کەسیان بۆ پاسەوانی کردنیان دانا. ئەو دوو وشترەیان لەشوێنێکی گۆڕەپانی شەڕ لەسەر ئەژنۆ دانا و ناویان نا (زویرەین) دووخوا، وتیان: لەگۆڕەپانی شەڕ راناکەین تا ئەم دوو وشترە رادەکەن. کاتێك باوکی مەفروق دوو وشترەکەی بینی، لەچۆنیەتی ئەم کارەی پرسی. بەسەرهاتەکەیان بۆ گێرایەوە. وتی: من (زویری) ئێوە بم. ئەو لەناو دوو ریزدا کەوتە سەر ئەژنۆ و وتی: دەوری من بگرن و لەدەوری من شەڕ بکەن و تا من رانەکەم، ئێوە رامەکەن. خەڵك شەڕێکی قورسیان کرد. شەیبانییەکان بەدوو وشترەکە گەشتن و سەریانبڕی. شەڕ لەسەر دوو وشترەکە قورستر بوو. تەمیمییەکان شکستیان خوارد و باوکی ئەلرەئیس رێبەر و فەرماندەی ئەوان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کوژرا. حوفزان کوڕی شەریك گەشتە ژنان و سامانەکان و بینی پیاوان لەوان

دوورکەوتونەتەوە و رویان لەگۆڕەپانی شەڕ کردووە. بەکرییەکان دەستیان بەسەر ژنان و سامانەکانی ئەوانـدا گرت و ژمارەیەکی زۆریان بەدیل گرت. حوفزانیش هەموو ئەوەی پیاوان بەجێیان هێشتبوو، تالانی کرد و ژنان و سامانەکانی هەڵگرت و تەندروست بۆلای هاورێکانی خۆی گەڕایەوە. ئەعشا وتاردەری بەناوبانگی عەرەب لەبارەی ئەم شەڕەوە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| یا سلم لا تسالی عنا فلا کشفت | عند اللقاء و لاسود مقاریف |
| نحن الذین هزمنا یوم صبحنا | یوم الزویرین فة جمع الاحالیف |
| ظللوا و ظلت تکر الخیل و سطهم | بالشیب منا و بالمرد الغطاریف |
| تستانس الشرف الا علی باعینها | لمح الصقور علت فوق الاظالیف |
| انسل عنها بسیل الصیف فانجردت | تحت اللبوود متون کالزحالیف |

واتاکەی: ئەی سەلەمی، سەبارەت بەو دەشتە پان و بەرینە هیچ مەپرسە، دەشتێك کە لەکاتی دیداری دوو سوپا، کەران تا کەرانی کرایەوە. هەروەها سەبارەت بەمارە زیاندەرەکان هیچ مەڵێ. ئێمە لەو رۆژەدا کەبەرەبەیان شەڕ دەستپێکرد، لەگۆڕەپانی شەڕی زویرەین لەناو هاوپەیمانانی خۆمان، دوژمنانمان تێکشکاند. ئەو رۆژەیان کردە شەو و ئەسپە تیژپێکانیش لەناو ئەواندا لەبەیانییەوە تا شەو شەڕیان کرد و غاریاندا و لەسەر ئەم ئەسپانە، پیرەپیاوان و گەنجە جوان روخسار و دلێر و شەڕکەرەکانی ئێمە دەبینران. لەپێشترینی گەورەییەکان لەچاوانی ئەوان ئاشنایی وئارامشیان پێبڕا بەشێوەیەك ژمارەیەکی زۆر لەلاشخۆرەکان لەسەر بەرزایی ئاسمان چاویان بڕییە کاوێژکەران لەسەر زەوی. بەگەشتنی لافاوە ماڵ وێرانکەرەکانی هاوین، خۆی لەوان کێشایەوە......................................................................

وتاردەران سەبارەت بەم شەڕە زۆریان قسە کردووە. بەتایبەت ئەغلەبی عیجلی. لەناو ئەوانە ئەرجوزەیەك بەم دەسپێکە:

ان سرك العز فجحجح بحشم

واتاکەی: ئەگەر بەرێزی تۆ شادمان دەکات، بە شکۆمەندییەوە بەرەوپێش برۆ.

لەم ئەرجوزەدا دەڵێت:

**جاؤوا بزويريهم و جئنا بالاصم　　شيخ لنا كالليث باق من ارم**
**شيخ لنا معاود ضرب البهم　　يضرب بالسيف اذاالرمح انفصم**
**هل غير غار صك غارا فانهزم**

واتاکەی: ئەوان دوو زویر (دوو خواکەی) خۆیان هێنا و ئێمە پاڵەوانە گەردنکێشەکانی خۆمان. پیرەپیاوێکی لێهاتوو هاوشێوەی شێری ژیان کە لەرۆژگاری ئەرەم بەجێمابوو بۆ ئەم زەمانە. پیرەپیاوێك لەئێمە کەسات ناسات هێرش دەکاتە سەر ئەسپە زمان بەستراوەکان و کاتێك رم بشکێت، بەشمشێر دەوەشێنێت. ئایا لەگەڵ هیچ غارێك شەڕی کرد کە لەبەردەم ئەو رای نەکرد.

مەبەستی لەدوو (غار) لەم دێرەدا، پیاوانی شەرکەی منالەکانی تەمیم و منالەکانی بەکرە. هەروەها ئەرجوزەیەکی دیکەی هەیە کە لەسەرەتاکەیدا دەڵێت:

**يا رب حرب ثرة الاخلاف**

واتاکەی: چەن زۆرن ئەو شەڕانەی چاوە شەرکەرەکان لێوانلێو لەفرمێسك دەکات.

لەم ئەرجوزەدا لەو رۆژە دەدەوێت.

دیل کرانی حاتەمی تایی

باوکی عوبەیدە دەڵێت: حاتەمی تایی هاورێ لەگەڵ سوپایەك لەخەڵکەکەی خۆی

هێرشی کردە سەر بەکر کوڕی وایل و شەڕیان لەگەڵ کردن. هۆزی تەی شکستی خوارد و زۆر لەوان ئەسیر یا کوژران. لەناو دیلەکان حاتەم کوڕی عەبدوللە تایی دەبینرا. ئەو لای پیاوێك لەعونەیزە بەدیلی مایەوە. رۆژێك ژنێك بەناوی عالیە وشترێکی بردە لایی و وتی: رەگی ئەمە ببڕە. ئەو سەری بڕی. کاتێك ژن وشترە کوژراوەکەی بینی، ترسا و قیژاندی. حاتەم ئەم شێعرەی وت:

| | |
|---|---|
| عالی لا تلتد من عالیة | ان الذی اهلکت من مالیه |
| ان ابن اسماء لکم ضامن | حتی یؤدی آنس ناویه |
| لا افصد الناقة فة انفها | لکننی اوجرها العالیه |
| انی عن الفصد لفی مفخر | یکره منی المصد الالیه |
| و الخیل ان شمس فرسانها | تذکر عند الموت امثالیه |

واتاکەی: ئەی عالیە، پشت مەکەر خوێنی فیچقە کردووە، ئەوەی بەفیڕۆمدا لەسامانی خۆم بوو. کوڕی ئەسما پارێزەری ئێوەیە تا ئەو کاتەی گەنجێك دێت و وشترەکە بەئێوە دەسپێرێت. لوتی وشتر کون ناکەم بەڵکو ڕمێکی درێژ لەسینەیدا جێ دەکەمەوە. من پشت دەکەمە رەگ لێدان و ئەم کارە دڵخۆشم ناکات. ئەگەر ئەسپ سواران خۆیان ئازار بدەن، لەکاتی گیاندان کەسانی وەك من بیر دێننەوە.

رەمیزی عەنزی وەك شانازی کردن بەئازایەتی خەڵکەکەی لەم شەڕەدا وتویەتی:

| | |
|---|---|
| و نحن اسرنا حاتما و ابن ظالم | فکل ثوی فی قیدنا و هو یخشع |
| و کعب ایاد قد اسرنا و بعده | اسرنا ابا حسان و الخیل تطمع |
| و ریان غادرنا بووج کانه | و اشیاعه فیها صریم مصرع |

واتاکەی: ئێمە حاتەم و کوڕی زاڵم مان گرفتار کرد و ئێستا هەردوك لای ئێمە ئەسیرن و کورنوش بۆ ئێمە دەبەن. دوای ئەوان کەعب کوڕی ئەیاد و باوکی حسانمان ئەسیر کرد و ئەسپەکان ئارەزوی هێرش و غاردانیان بوو. بەخێرایی (ریان)مان پێوا

و دەورمان گرت بەشێوەیەك خۆی و دەوروبەرەكەی لەوێ، لەدەستە گیایەكی بڕاو دەچون و لەخوێنی خۆیاندا دەتلانەوە.

یەحیا كوڕی مەنسور زوهەلی قەسیدەیەكی هۆنییەوە و شانازی بەشەڕەكانی خەڵەكەكەی خۆیەوە كرد. قەسیدەكە دوور و درێژ و ڕێنوێنی باشی لەخۆ دەگرت. بۆ ئەوەی د.ڕێژدادڕی نەبێت، لەباس كردنی چاومان پۆشی. دەسپێكەكەی بەم شێوەیە:

امن عرفان منزلة و دار          تعاورهاالبووارح و السواری

واتاكەی: ئایا (عیرفان) شوێنی مانەوە و ماڵی هەیە؟ شوێنێك كەشەوەكان بەردەوام لێی بەسەر دەچن و هەورە شەوانەكان بەردەوام بەسەر سەری دەسوڕێنەوە.

باوكی عوبەیدە دەڵێت: كاتێك ئیسلام هات، لەسەراسەری عەرەب كەسێك ماڵێكی بەرێزتری لەشەیبانییەكان نەبوو و باشتر پاسەوانی پەنابەرانی خۆی نەدەكرد و هاوپەیمانی زیاتری لەگەڵدا نەبوو. عەنینە لەلەخم لەناو هاوپەیمانەكانی دەبینرا. لەمەككە كوڕی كیندە لەگەڵ مناڵەكانی هیند دراوسێ و عێكرمە لەتەی و حەوتەكە لەمناڵەكانی عوزرە و بوونانە، هەموو ئەمانە لەهەژماری مناڵەكانی حارس كوڕی هەمام بوون. عایدە لەقورەیش و حەواس و زەببە لەكێندە هەموویان لەمناڵەكانی ئەبی ڕەبیعە هەژمار دەكران. سەلیمە لەمناڵەكانی عودەی، قەیس لەهەژماری مناڵەكانی ئەسعەد كوڕی هەمام و وەسیلە لەمناڵەكانی سەعلەبە و مناڵەكانی خەیبەری لەتەی لەناو شەیبانییەكان دەژیان و عەوف كوڕی حارس لەكیندە هاوڕێی مناڵەكانی موحەلیم بوون.

هەمووی ئەمانە ئەو هۆزە و لقانە بوون كەهاوسێیەتی مناڵەكانی شەیبانیان هەڵبژارد و لەم ڕێگەوە گەورەیی و شكۆمەندییان پێبڕا و ژمارەیان زیادی كرد.

## شەڕی موسحولان

باوکی عوبەیدە دەڵێت: ڕەبیعە کوڕی زیادی کەلبی لەگەڵ سوپایەك لەخەڵکەکەی خۆی هاتەدەر و مەبەستی شەڕی کرد و ڕووبەڕوی لەشکرێك لەمناڵەکانی شەیبان بوویەوە کەزۆربەیان لەمناڵەکانی باوکی ڕەبیعە بوون. ئەم دوو سوپایە بەسەختی شەڕی یەکیان کرد. مناڵەکانی شەیبان سەرکەوتن و ئەوانیان شکستدا و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. ئەمە لەشەڕی موسحولان رویدا. خەڵکێکی زۆریشیان بەئەسیری گرت. سەرکردەی شەیبانییەکان لەم ڕۆژەدا حەیتن کوڕی عەبدوللە کوڕی قەیسی موحەلیمی بوو. دەستەیەك دەڵێن: ڕێبەرەکەیان زیاد کوڕی مورسەد لەمناڵەکانی باوکی ڕەبیعە بوو: وتاردەری ئەوان وتی:

| | |
|---|---|
| سائل ربيعة حيث حل بجيشه | مع الحی كلب حيث لبت فوارسه |
| عشية ولى جمعهم فتتابعوا | فصار الينا نهبه و عوانسه |

واتاکەی: لەڕەبیعە بپرسە کەلەشکرییەکانی لەهەمۆ هۆزی کەلب لەکوێ دابەزین و سوارکارەکانی لەکوێ مانەوە. ئەو ئێوارێیە کەدەستەی ئەوان هەڵاتن و تاڵانی سامانەکانی ئەوان بووە بەهرەی ئێمە و کچە مێردنەکردووەکانیان دەست ئێمە کەوت.

دواتر ڕەبیع کوڕی زیادی کەلبی پشتی کردە خەڵکەکەی خۆی و شەڕی ئەوانی کرد. ئەوان، ئەویان شکستدا. ئەو خۆیان لەوان دوورخستەوە و بەرێکەوت و لەناو مناڵەکانی ·شەیبان نیشتەجێ بوو. پەنای بردە پیاوێك بەناوی زیاد لەمناڵەکانی باوکی ڕەبیعە بەلام مناڵەکانی ئەسعەد کوڕی هەمام ئەویان کوشت. دواتر شەیبانییەکان دوسەد وشتریان وەك خوێنبایی بەکەلبیەکان دا و ڕازییان کردن.

## شەڕی سولەیم و شەیبان

باوکی عوبەیدە دەڵێت: شەڕکەرانێك لەناو منداڵەکانی سولەیم بەفەرماندەیی نەسیبی سولەیمی هاتنەدەر و مەبەستی شەڕ لەگەڵ بەکر کوڕی وایلیان کرد. پیاوێك لەمنداڵەکانی شەیبان بەناوی سولەیع کوڕی عەبد غەنەم چاوی بەوان کەوت. ئەو سوار لەسەر ئەسپێك بەناوی (بحرا) و جل و بەرگی ئیحرامی لەبەردابوو ( کەدەیوسیت حەجی پێوە بکات). بەوانی وت: مەبەستی کوێتان هەیە؟ وتیان: دەمانەوێت هێرش بکەینە سەر شەیبانییەکان و لەناویان ببەین. سولەیع وتی: کەمێك درەنگ بکەن چوونکە چاکەخوازی ئێوەم. سوێند دەخۆم ئەگەر دەست بۆ ئەوان درێژ بکەن سێسەد پیاوی سواری شەڕکەر لەسەر سێسەد ئەسپی خەساو هێرش دەکەنە سەر ئێوە و ئەمە جیاواز دەبێت لەئەسپە نێر و مێ کانی دیکە. ئەوان ئەم پەندەیان نەبیست و لەسەر هێرش کردن پێداگریان کرد. سولەیع کوڕی عەبد غەنەم ئەسپەکەی خۆی غاردا و بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە و ئاگاداری کردنەوە. شەیبانییەکان سوار بوون و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. منداڵەکانی سولەیم هاتن و ئامادەیی ئەوانیان بۆ شەڕ بینی. شەڕێکی قورس رویدا و تیایدا شەیبانییەکان سەرکەوتن و سولەیمیەکان شکستیان خوارد و زۆریان لێ کوژرا و زۆریان بەدیلی گیران. جگە لەکەمێکیان رزگاری نەبوو. نەسیبی فەرماندەکەیان گرفتار بوو. عیمران کوڕی مورەی شەیبانی ئەسیری کرد و کوشتی. سولەیع وتی:

نهيت بنى زعل غداة لقيتهم — و جيش نصيب و الظنون تطاع
و قلت لهم ان الحريب و راكسا — به نعم ترعى المرار رتاع
و لكن فيه الموت يرتع سربه — و حق لهم ان يقبلوا و يطاعوا
متى تانه تلقى على الماء حارثا — و جيشا له يوفى بكل بقاع

واتاکەی: بەرمبەیان کەچاوم بەکوڕەکانی زەعل کەوت و سوپای نەسیبم بینی،

ئەوانم لەشەڕ ئاگادار کردەوە. بەوانم وت: لەشوێنێك(حەریب) و (راکس)چوارپێکانێك هەن کەگوڵی گەنم دەخۆن و لەلەوەڕان ناوەستن. بەڵام مەرگیش لەوێ ئامادەیە و بەخێرهاتنی میوانەکانی خۆی دەکات و ئەوان بۆ لەوەڕگای لەناوچون بانگ دەکات. شیاو بوو گوێ لەپەند بگرن و فەرمان ببەن. هەر زەمان بۆ ئەوێ بێیت، لەسەر ئاوەکەی پاسەوانێك دەبینی و چاوت بەو سوپاییانە دەکەوێت کەهەموو شوێنێکیان پڕ کردووە.

## شەڕی جەدود

لەم شەڕەدا پیاوانی بەکر کوڕی وایل لەگەڵ منداڵەکانی مێنقەڕ شەڕیان کرد.

بەسەرهاتەکە بەمشێوەبوو: حوفزان یانی حارس کوڕی شەریکی شەیبانی لەگەڵ منداڵەکانی سەلیت کوڕی یەربوع، دۆستایەتی و پەیوەندی بوو. ئەو مەبەستی خیانەتی لەوان کرد و منداڵەکانی شەیبان و زوهەل و لەهازمی کۆکردەوە و فەرماندەیی ئەوانی بەحومران کوڕی عەبد عەمرۆ کوڕی بیشر کوڕی عەمرۆ دا. دواتر بۆ شەڕ بەرێکەوت و هیوای خواست شوێنێکی سست و لاواز لەمنداڵەکانی یەربوع بدۆزێتەوە یا بێ ئاگایی و کەمتەرخەمییەکی لەوان دەستکەوێت تا لەو رێگەوە هێرش بکاتە سەریان. کاتێك گەشتە سەرزەمینی منداڵەکانی یەربوع، عوتەیبە کوڕی حارس کوڕی شیهاب لەمەبەستە خراپەکەی ئاگادار و خەڵکەکەی خۆی ئاگادار کردەوە. ئەوان رێگەی ئاویان لەحوفزان گرتبەر. حوفزان بەعوتەیبەی وت: من لەگەڵ تۆ جگە لەکەس و کارت نابین بەڵام لەگەڵ من دەستەیەکی زۆر لەبەکریەکانن، ئەگەر بەسەر ئێوەدا زاڵ ببم، ژمارەی ئێوە کەم دەبێتەوە و دوژمنان چاوی تەماح دەبڕنە ئێوە. ئەگەر ئێوە بەسەر مندا زال بن، جگە لەناسراوە دوورەکانی من ناکوژن. من لەسەرەتاوە مەبەستی ئێوەم نەبوو. ئێستا پێشنیارتان پێدەکەم لەگەڵ ئێمەدا بەئاشتی هەڵبکەن و خورماکانی ئێمە بگرن کەسوێند بەخوا هیچ کات یەربوعییەکان ئازار نادەم. ئەو خورماکانی ئەوانی گرت و ئازادی کردن. بەکرییەکان ڕۆشتن و هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی رەبیع کوڕی حارس و ئەو لەجەدود دەژیاد و بە(دواکەوتوو) (مقاعس) ناودەبرا. لەبەر ئەوە بەم شێوە بانگیان دەکرد کە لەپەیمانی منداڵەکانی سەعد خۆی کێشایەوە و دواکەوت. حوفزان هێرشی کردە سەریان. ئەوان لەکەسەکانی خۆیان دوور بوون. ئەو ئەسیر و چوارپێکانی کۆکردەوە. منداڵەکانی ڕەبیع دادخوازی خۆیان بۆلای منداڵەکانی کولەیب نارد کەوەڵامیان نەدایەوە و هاوکاریان نەکردن. دادخواز ڕۆشتە لای منداڵەکانی مێنقەر کوڕی عوبەید. پیاوەکانی بۆ گەڕان بەشوێن دوژمن سوار بوون و رویان کردە بەکر

کوڕی وایل. حوفزان لەسێبەری دارێکدا دانیشتبوو کە لەناکاو ئەهتەم کوڕی سومەی کوڕی سنانی مێنقەری لەسەر سەری خۆی بینی. سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و ئەهتەم هاواری کرد: ئەی سەعدییەکان! حوفزان هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی وایل! منداڵەکانی مێنقەر هاتنە ناو گۆڕەپانی شەڕ. بەکرییەکان شکستیان خوارد و ئەسیر و تالانییەکانیان بەجێهێشت و مێنقەرییەکان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی زۆر لەوانیان بەدیل گرت و ژمارەییێکیشیان لێ کوشتن. ئەهتەم، حومران کوڕی عەبد عەمرۆ فەرماندەی سوپایی دوژمنی بەئەسیری گرت. قەیس کوڕی عاسمی مێنقەری جگە لەکوشتن یا گرتنی حوفزان مەبەستێکی دیکەی نەبوو. سوار لەسەر ئەسپ شوێن حوفزان کەوت و حوفزان پەڕییە سەر ئەسپێکی تیژ پێ و هەڵات. قەیس لەحوفزان نزیک بوویەوە بەڵام نەیتوانی بیگرێت. کاتێك ترسی ئەوەی لێ نیشت کە لەدەستی رابکات، ڕمێکی بۆ پشتی هاویشت. حوفزان بەپەلە رایکرد و خۆی لێ دوور خستەوە و تەندروست رزگاری بوو. لەو رۆژەوە حوفزان بە( راکەڕی بەپەلە) ناوی دەرکرد. سەبارەت بەناو نانی ئەو ئامازەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. ئەهتەم سەبارەت بە دیل کردنی حومران بەدستی خۆی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| نیطت بحمران المنیة بعدما | حشاه سنان من شارعة ازرق |
| دعا یال قیس و اعتزیت بمنقر | و کنت اذا لاقیت فی الخیل اصدق |

واتاکەی: مەرگ حومرانی گرتەوە و شەڕی لەگەڵ کرد و ئەمە دوای ئەوە بوو کە ڕمێکی کەوەیی لەشوراعە ئەوی پێکا. ئەو قەیسییەکانی بانگ دەکرد و من مێنقەرییەکان. کاتێك سوار لەسەر ئەسپ روبەروی دوژمن دەبمەوە، راست دەڵێم و دروست هەڵس وکەوت دەکەم.

سوار کوڕی حییان مێنقەری وەك شانازی کردن بەخۆی لەبەرابەر پیاوێك لەبەکەرییەکان وتویەتی:

| | |
|---|---|
| و نحن حفرنا الحوفزان بطعنة | کسته نجیعا من دم البطن اشکلا |

| | |
|---|---|
| و حمران قسرا انزلته رماحنا | فهالج غلا فی ذراعیه مثقلا |
| فیالك من ایام صدق نعدها | کیوم جواثا و النباج و نبتلا |
| قضی الله انا یوم تقتسم العلی | احق بها منکم فاعطی فاجزلا |
| فلست بمسطیع السمأ و لم تجد | لعز بناه الله فوقك منقلا |

واتاکەی:

ئێمە گورزێکمان لەحوفزان دا و جلێك لەخوێنی ڕەش و ڕەنگاورەنگ، سکی ئەوی داپۆشی. ڕمەکانی ئێمە بەزۆر حومرانیان دیل کرد و ئەو میوانداری زنجیرێکی گرانباری لەسەر دوو بازوی خۆی کرد. چەند زۆرن ئەو ڕۆژ دروست و پیاوانەی کەدەتوانین بۆ خۆمانی بژمێرین: ڕۆژی جواسا و نەباج و ڕۆژی نەبتەل ( کێوێك لەسەرزەمینی تەی). خوا بەمشێوە فەرمانیدا کاتێك ریزدارییان دابەش دەکرد، ئێمە لەئێوە شیاوتربین بۆی، لەبەرئەمە بەئێمەی بەخشی و زۆری بەئێمە بەخشی. تا نەتوانی لەگەڵ چارەنوسی ئاسمان شەڕ بکەیت و ناتوانیت لەشکۆیەك کەخوا بەسەر سەرت هەڵیکردووە، بۆ شوێنێکی دیکە کۆچ بکەیت.

## شەڕی ئەیاد
## ( شەڕی ئەعشاش و شەڕی عوزالەی )

لەبەر ئەوە پێی دەڵێن شەڕی عوزالەی چوونکە تیایدا بێستام کوڕی قەیس و مەفروق کوڕی عەمرۆ و هانی کوڕی قەبیزە لەسەر فەرمانڕەمیی درگیر بوون. بەکرییەکان لەژێر فەرمانی ئێرانییەکان و خوسرەو شای شاکانی ئێران بوون. ئێرانییەکان خواردن و ساز وبەرگیان پێ دەدان. ئەوان لەدەستەیەکی سێسەد کەسی و هاوپشت لەلای فەرمانداری عەین ئەلتەمەر بەرێکەوتن و هیوایان بەوە بەست کەمناڵەکانی یەربوع بەرەو (حوزن) (سەرزەمینە ناهەمووارەکان) بڕۆن. لەبەر ئەمە مناڵەکانی عوتەیبە و مناڵەکانی عوبەید و مناڵەکانی زوبەید لەحوزن دابەزین و مناڵەکانی زەبید لە(حەدیقە) (بێستان). مناڵەکانی عوبەید و مناڵەکانی عوتەیبە لە(**روضة الثمد**) (بێستانی کەم ئاو) دابەزین. سوپای بەکریەیکان هات و لە(**حضبة الحصی**) ( داوێنی زیخەلآنی کوێستان) مایەوە. بێستام لەحەدیقە ڕەشاییەکی بینی و سەیری گەنجێکی کرد و ناسیەوە چوونکە لەو کاتەوەی عوتەیبە ئەوی بەدیلی گرتبوو، لاوەکانی مناڵەکانی سەعلەبەی دەناسییەوە. بێستام سەبارەت بەو ڕەشاییە لەو لاوە پرسیاری کرد. لاو وتی: مناڵەکانی زوبەیدن. بێستام پرسی، ژمارەیان چەندە؟ لاو وتی: پەنجا بنەماڵە. بێستام پرسی: ئەی مناڵەکانی عوبەید و مناڵەکانی عوتەیبە لەکوێن؟ لاو وتی: لە**روضة الثمد** و خەڵکانیتر لەخوفافند. (خوفاف ناوی شوێنێکە). بێستام بەخەڵکەکەی وت: ئەی بەکرییەکان، ئایا لەمن فەرمان دەبەن؟ وتیان: بەڵێ. بێستام وتی: بەباشی دەزانم ئەم هۆزە بەتەنیا جێماوە تالآن بکەن (یانی مناڵەکانی زوبەید) و سەلآمەت بگەڕێنەوە. وتیان: مناڵەکانی زوبەید چییان هەیە تالآنی بکەین؟ وتی: بەسلآمەت ڕزگار بوون یەکێك لەدوو تالآنییەکەیە. وتیان: عوتەیبە کوڕی حارس (دوژمنی تۆ) مردووە. مەفروق وتی: ئەی باوکی سەهبا، سنوری خۆت بەزاندووە. هانی وتی: خەفە بە. بێستام وتی: ئەسید کوڕی جەبات

شەو ورۆژ لەماییینە سورەکەی خۆی جیا نابێتەوە. کاتێك دەنگی سمی چوارپێکان و هاواری ئێوە ببیستێت، سواری دەبێت و دەرواتە سەر مەلیحە و هاوار دەکات: ئەی کورەکانی سەعلەبە! لەم کاتەدا ئەو گورزانەتان بەردەکەوێت کەتالأنی لەبیر ئێوە دەباتەوە و هیچ کام لەئێوە نازانێت هاورێکەی لەکوێدا لەخاك و خوێندا تلأوەتەوە. ئێوە نافەرمانی منتان کرد و من شوێنکەوتووی ئێوەم و بەزویی هەموو شتێك رون دەبێتەوە.

ئەوان هێرشیان کردە سەر منالەکانی زوبەید و دواتر رویان کردە منالەکانی عوبەید و منالەکانی عوتەیبە. ماییینەکەی ئەسید کوترانی سمی چوارپێکانی لەسەر زەوی بیست و سمی لەزەوی کوتا. ئەسید سواری بوو و روی کردە مەلیحە و بەم شێوە بانگی منالەکانی یەربوعی کرد: ئەی هاوار لەم بەرەبەیانە شوومە! ئەی بنەمالەی سەعلەبە کوری یەربوع! هێشتا خۆر هەلنەهاتبوو کەئەوان گەشتن و شەرێکی قورس دەستیپێکرد. منالەکانی شەیبان دوای کوشتنی ژمارەیەك لەشاسوارەکانی ئەوان، شکستیان خوارد و لەشەیبانییەکانیش ژمارەیەك کوژران و دیل کران. یەکیان هانی کوری قەبیسە بوو، ئەسیر کرا و بەهای ئازادی خۆیدا و خۆی کرییەوە. موتەمەم کوری نویرە سەبارەت بەم شەرە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| لعمری لنعم الحی اسمع غدوة | اسید و قد جد الصراخ المصدق |
| واسمع فتيانا كجنة عبقر | لهم ريق عند الطعان و مصدق |
| اخذن بهم جنبی افاق و بطنها | فما رجعوا حتى ارقوا و اعتقوا |

واتاکەی: بەگیانی خۆم سوێنك کەگەنجانێکی شایستە بوون ئەوانەی لەکاتی بەرەبەیان هاورێ لەگەڵ ئەسید هاتن و من دەنگیانم بیست و بینیم دەنگی پیاوە شەرکەرەکان بەرز بۆتەوە. دەنگی لاوانی شەرکەرێکم بیست کە لەپەریانی عەبقەر دەچوو( عەبقەر شوێنێکە عەرەبەکان گومان دەکەن سەرزەمینی پەرییەکانە) و لەکاتی هاتنە خوارەوە شمشێر و رم، بەباشی غاریان دەدا و شەڕیان دەکرد. لەگەڵ ئەوان دوولای (ئافاق) و دەوروبەریان گرت، لەشەر نەوەستان تا دوژمنانیان کردە

کۆیلەی خۆیان و دواتر ئازادیان کردن.

عەوام سەبارەت بەم شەڕە دەڵێت:

قبح الاله عصابة من وائل    یوم الافاقة اسلموا بسطاما
و رای ابوو صهباء دون سوامهم    طعنا یسلی نفسه و زحاما
کنتم اسودا فی الوغی فوجدتهم    یوم الافاقة فی الغبیط نعاما

واتاکەی: خوا ناشیرین کات دەستەیەك لەوایل کە لەرۆژی ئافاق بێستامیان بەتەنیا جێهێشت. باوکی سەهبا لەبەرابەر چوارپێکانی ئەوان گورزی دەوەشاند و خۆی و خەڵکەکەی ئارام دەکرد. ئێوە لەگۆڕەپانی شەڕ شێرانی ژیان بوون و لەرۆژی ئافاقە لەغەبیت چاوتان بەگایەلی وشترملەکان (دوژمنە بێ زاتەکان) کەوت.

عەوام وتاری زۆری سەبارەت بەم شەڕە هەیە. کاتێك پێداگری کرد، بێستام وشترەکەی گرت. دایکی وتی:

اری کل شعر اصاب بشعره    خلا ان عواما بما قال عیلا
فلا ینطقن شعرا یکون جوازه    کما شعر عوام اعام و ارجلا

واتاکەی: هەر وتاردەرێك دەبینم کە لەرێگەی هۆنراوەکانی خۆیەوە بەشوێنێك دەگات جگە لەعەوام کەهەوساری ئەسپەکەی خۆی بەهۆی هۆنراوەکانییەوە لەدەست دا. نەکات لەدەم بێتەدەر ئەو هۆنراوەی کەپاداشتەکەی وەك پاداشتی هۆنراوەکانی عەوام بێت کەپەتی پچراند وخۆی پیادە کرد.

## شەڕی شەقیقە و کوژرانی بێستام

لەم ڕۆژەدا لەنێوان مناڵەکانی شەیبان و زەببە کوڕی ئود شەڕ رویدا و بێستام کوڕی قەیس ڕێبەری شەیبانییەکان کوژرا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو بێستام کوڕی قەیس کوڕی مەسعود کوڕی خالید کوڕی عەبدوللە زی ئەلجەدەین شەڕی منالەکانی زەببەی کرد و براکەی سەلیل کوڕی قەیس هاوڕێیەتی دەکرد. هاورێ لەگەڵ ئەوپیاوێك لەمنالەکانی ئەسەد کوڕی خەزیمە بەناوی نەقید بوو کە بەباڵندەکان فاڵی دەگرتەوە و پێشگۆیی دەکرد. کاتێك بێستام بەشێکی ڕێگەی بڕی، شەوێك لەخەودا بینی پیاوێك هاتە لایی وپێی وت: (سەتڵی پڕ دێتە سەر و دەگاتە خلیزگە و سەرەوخوار دەبێت و ئاو دەرژێت). خەوەکەی خۆی بۆ نەقید گێرایەوە و نەقید بەخراپی لێکی دایەوە و وتی: بۆ نەتوت (دەگەڕێتەوە و پڕ دەبێتەوە) تا خراپیەکەی نەمێنێت؟ بێستام روی کردە ڕێگا و ڕۆشتە پێش. کاتێك گەشتە تەپۆڵکەیەك بەناوی (حەسەن) لەسەرزەمینی زەببە، ڕۆشتە سەری تا بەرچاوی خۆی ببینێت. لەناکاو بینی چوارپێکان و ئەسپەکان سەراسەری بیابانیان پڕ کردەوە و لەناو ئەوان هەزار وشتری مێی مالیك کوڕی مونتەفیقی زەببی لەمنالەکانی سەعلەبە کوڕی سەعد کوڕی زەببەیە کە چاوی وشتری نێری ئەوانیان کوێر کردووە، دەبینرێت. لەسەردەمی جاهلی کاتێك ژمارەی وشترەکان بەهەزار دەگەشت، چاوی وشتری نێریان کوێر دەکرد تا چاوەزاری نەوێت. وشترانێکی لەوەڕاوی بەهار و قەڵەو بوون و مالیك کوڕی مونتەفیق سوار لەسەر ئەسپ لەناویاندا دەسوڕایەوە.

کاتێك بێستام ڕۆشتە سەر تەپۆڵکەکە ترسا ببینین و ئاگادار ببنەوە. لەبەر ئەمە ڕاکشا و بەهێواشی هاتە خوار و خۆی گەیاندە لای کەسەکانی، وتی: ئەی منالەکانی شەیبان، تا ئەمرۆ هاوشێوەی ئەمەم نەبینیوە کە ئەم هەموو چوارپێیە بەڕەڵا بن و خواوەندەکانیان لێیان بێ ئاگا و بتوانرێت بەهێرشێکی لەناکاو هەموویان بگرین. نەقید سەیری ریشی بێستامی کرد و بینی خۆڵاوی بووە چوونکە لەسەر زەوی

خزاوە. دوبارە فاڵی خراپی لێدا و وتی: ئەگەر مەل ڕاست بکات، ئەو یەکەم کەس دەبێت دەکەوێتە سەر زەوی و دەکوژرێت. پیاوی ئەسەدی مەبەستی جیابوونەوە لەبێستامی کرد بەڵام لەئەندێشەی دووری و جیای لەو، لەرزە دایگرت. لەبەر ئەمە وتی: ئەی باوکی سەهبا بگەڕێرەوە چوونکە دەترسم بکوژرێیت. بێستام گوێی نەگرت و نەقید لێی جیابوویەوە.

بێستام و هاوەڵانی سوار بوون و هێرشیان کردە سەر وشترەکان و ئەوانیان بۆ پێشەوە برد. وشتری نێر مالیك بەناوی (باوکی شاعیر) کە چاوێکێکی کوێر بوو، لەناویاندا دەبینرا. مالیك پەڕییە سەر ئەسپەکەی خۆی و بەسلامەت رزگاری بوو و کاتێك گەشتە سەر تەعشار، هاواری کرد: ئای خەڵکینە، دوژمنان گەشتن! ئەوسا گەڕایەوە. سواران گەشتنە تاڵانیکەران و بینیان گایەلی وشترە تاڵانییەکە بۆ پێشەوە دەبەن. وشتری نێری ئەو باوکی شاعیر بۆ دواوە رایدەکرد تا بگەڕێتەوە و وشترەکان شوێنی دەکەوتن. هەر وشترێکی مێ کەشوێنی دەکەوت بێستام دەیکوشت. کاتێك مالیك بینی بێستام و هاورێکانی چی دەکەن، هاواری کرد: ئەی بێستام، ئەمە چ ناعەقڵییەکە! مەیان کوژە کە یان هی ئێمە دەبن یان هی تۆ. بێستام گوێی نەگرت. بێستام لەدوای خەڵکەکەی خۆی سوار لەسەر ئەسپێك بەناوی زەعفەران و پاسەوانی پیاوەکانی خۆی دەکرد. کاتێك سوارەکانی زەببە گەشتن، مالیك بەوانی وت: تیر لەمەشکی ئاوەکانیان بدەن. ئەوان تیریان بۆ مەشکی ئاوەکان هاویشت و کونیان کردن. منداڵەکانی سەعلەبە گەشتن و لەپێش هەموویانەوە پیاوێکی نەزان بەناوی عاسم کوڕی خەلیفەی سەباحی بوو. ئەو پێشتر ڕمێکی بەدوای خۆیدا دەکێشا. پێیان دەوت: ئەی عاسم چی بەمە دەکەیت؟ دەیوت: بێستام دەکوژم. کاتێك دادخواز هات، عاسم بێ فەرمانی باوك سوار ئەسپ بوو و خۆی گەیاندە سوارەکان. بەیەکێك لەپیاوەکانی زەببەی وت: سەرکردە کامەیە؟ وتی: ئەوەی لەسەر ئەسپە ڕەشەکەیە. عاسم غاریدا تا گەشتە بەرابەری، ئەوسا ڕمەکەی لەنێوان گوێچکەیدا چەقاند بەشێوەیەك لەگوێچکەکەی دیکەیەوە هاتەدەر. بێستام کەوتە سەر دارێك بەناوی (ئالائە). کاتێك شەیبانییەکان ئەمەیان بینی، چوارپێکانیان بەجێهێشت و هەڵاتن. زۆریان کوژرا و زۆریان ئەسیر کران. منداڵەکانی سەعلەبە ئەجاد کوڕی قەیس برای

بێستامیان هاورێ لەگەڵ هەفتا شەیبانی ئەسیر کرد. عەبدوللە کوڕی عەنمەی زەببی هاوسێی شەیبانییەکان بوو. ترسا بیکوژن.

منالانی زەید کوڕی عەمرۆ کەڕ بوون و هیچ کوژراوێك هاوتای بێستام نابێت. ئەو کەوتە سەر داری ئالالە و کەس لەژێر سەر یا پەیکەری سەرین و جێگە راناخات، وەك بڵێی ناوچاوی ئەو شمشێرێکی درەوشاوە بوو. ئەگەر منالەکانی باوکی شینی بۆ بکەن شیاوە چوونکە پرسەیەکەی گەورە روی تێکردون و پیاوێکی مەزنیان لەدەست داوە. پیاوێکی رۆژیدەر کەوشترانی کلك قوتی بێچو لەشیر گرتو دەکوژێت و گۆشتەکەی دەبرژێنێت و دەیهێنێتەوە وبۆماڵ و لەسەر سفرە دایدەنێت.

چوونکە بێستام پێگەیەکی بڵندی هەبوو، هیچ ماڵێك لەناو بەکەر کوڕی وایل نەبوو، لەمەرگی ئەو پرسەگێڕ نەبێت و بۆ دایکی بێستام کوڕی قەیس لەپرسەکەیدا وتی:

لبيك ابن زي الجدين بكر بن وائل فقد بان منها زينها و جمالها
اذا ما غدا فيهم غدا و كانهم نجوم سماء بينهن هلالها
فلله عينا من راى مثله فتى اذا الخيل يوم الروع هب نزالها
عزيز المكر لا يهد جناحه و ليث اذا الفتيان زلت نعالها
و حمال اثقال و عائد محجر تحل اليه كل ذاك رحالها
سيبكيك عان لم يجد من يفكه و يبكيك فرسان الوغى و رجالها
و تبكيك اسرى طالما قد فككتهم و ارملة ضاعت و ضاع عيالها
مفرج حومات الخطوب و مدرك الـ ـحروب اذا صالت و عز صيالها
تغشى بها حينا كذاك ففجعت تميم به ارماحها و نبالها
فقد ظفرت منا تميم بعثرة و تلك لعمرى عثرة لا تقالها
اصيبت به شيبان و الحى يشكر و طير يرى ارسالها و حبالها

واتاکەی: دەبێت منالەکانی بەکر کوڕی وایل بۆ کورەکەی زو ئەلجودەین بگرین و شین بکەن چونکە جوانی و رازاوەیی لەوان جیابوویەوە و دور کەوتەوە. کاتێك

لەگەڵ ئەوان بەرێکەوێت، بەشێوەیەك خەرامان دەبن کەدەڵێی ئەستێرەکانی ئاسمانن و مانگێکی نوێ لەناو خۆیان هاورێ لەگەڵ ئەوان دەرکەوتووە. کاتێك لەرۆژی شەڕ و ترسی پاڵەوانەکان، روبەروبوونەوەی سوارەکان لەگەڵ یەك دەست پێ بکات، خۆزگە بەو چاوەی جوامێرێکی وەك ئەوی بینیبێت. هاوشێوەی رێزداران هێرش دەکات و بارەگای ئەو بەهێرش کردن دانارمێت و لاواز نابێت. کاتێك پێی لاوەکان بخزێت، ئەو شێرێکی بوێرە. دەچێتە ژێر بارە گرانەکانی خەڵکەکەی خۆی و بێ بەشەکان تیمار و نیازمەندان خۆیان دەپێچنەوە و رووی تێدەکەن. گرفتارێك کەکەسی دەست نەکەوێت بەندەکانی بپچڕێنێت، بۆ تۆ دەگریت و سوارە بەئەزمونەکانی خەڵکەکەی خۆت لەشەڕ لەگەڵ سوارەکانی ئەو بۆ تۆ دەگرین چوونکە بەردەوام بۆ ئازادی ئەوان هەوڵت دەدا و بێوەژنەکان دەگرین چوونکە پێشێل کراون و ناندەری ئەوان کوژراوە. چارەسەرکەری گرێ دژوارەکان لەپێشهاتە گیانبڕەکان و شەڕە دژوارەکان و کاتێك ئاگری شەڕ خۆش و زۆپای جەنگ سور دەبوویەوە، روی لەگۆڕەپانی شەڕ دەکرد و کاروبارەکانی دەگرتە دەست و کارە قورسەکانی لەسەر شانی کەسانیتر هەڵدەگرت. بەمشێوەبوو کە پەیامبەری نەمان ئەوی گرت و بردی و تەمیمیەکان بەکوشتنی ئەو ئێمەیان پرسەگێڕ کرد و تیر و ڕمی خۆیان تێراو کرد.

تەمیمییەکان دەستیان بەسەر هەڵەیەك لەئێمە گرتووە بەڵام سوێند دەخۆم بەگیانی خۆم کە بەبیانوی ئەوان بۆ ئەم هەڵەیە رازی نابن و لەگوناحی ئەوان خۆش نابن.

لەمەرگی ئەو لەشکریان و خەڵکی هۆزەکەی پرسەیان گێرا و ئەو باڵندانەی بۆ ئاسمان بەرەلا دەکران، پەڕ و باڵەکانیان دەبەسترا یا خۆیان دەگەڕانەوە.

## شەڕی نێسار

نێسار ناوی زنجیرە کێوێکی پەیوەستە کەشەڕەکە تیایدا رویدا. ئەم زنجیرە کێوە لەناو عەرەبەکان بەناوبانگە.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو منداڵەکانی تەمیم کوڕی موڕ کوڕی ئود رۆژی مامەکانی خۆیان منداڵەکانی زەببە کوڕی ئود و منداڵەکانی عەبد مەنات کوڕی ئودیان دەخوارد و لەسامانەکانی ئەوان رۆژگاریان دەگوزەراند. جارێکیان واپێشهات منداڵەکانی زەببە کوڕی ئود هێرشیان کردە سەر دەستەیەك لەتەمیمیەکان. منداڵەکانی تەمیم شوێنیان کەوتن بەڵام دەستەی رەباب لەگۆڕەپانی شەڕ دوورکەوتنەوە و هەڵاتن. ئەمانە پێك هاتبوون لەم کەسانە: تیم، عودەی، سور ئەتحەل، عوکل، منداڵەکانی عەبد مەنات کوڕی ئود و زەببە کوڕی ئود. لەبەر ئەوە پێیان دەوتن رەباب چوونکە لەکاتی هاوپەیمان بوون، دەستەکانی خۆیان کردە ناو گوشراوی میوە (روب) (دۆشاو) و پەیوەستی منداڵەکانی ئەسەد بوون کەلەم کاتەدا هاوپەیمانانی منداڵەکانی زوبیان کوڕی بەغیز بوون. فریاد خوازی منداڵەکانی زەببە هاواری کرد: ئەی منداڵەکانی خێندەف، فریام کەون! منداڵەکانی ئەسەد فریایی کەوتن. ئەمە یەکەم رۆژ بوو منداڵەکانی زەببە فریادخوازی بەرنە لای خێندەف و داوای هاوکاریان لەهاوپەیمانەکانی خۆیان زەببی و غەتەفان کرد. سەرکردەی ئەسەدییەکان لەشەڕی نێسار عەوف کوڕی عەبدوڵلە کوڕی عامر کوڕی جەزیمە کوڕی نەسر کوڕی قەعین و بەوتەی هەندێ کەس، خالید کوڕی نەزەڵە بوو. سەرکردەی رەبابیەکان ئەسوەد کوڕی مونزەر برای نەعمان کوڕی مونزەر بوو. بەڵام ئەمە راست نییە. سەرکردەی هەموویان حێسن کوڕی حوزەیفە کوڕی بەدر بوو. سەبارەت بەم شەڕەیە زوهەیر کوڕی ئەبی سولەمی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| و من مثل حصن فی الحروب و مثلة | لانداد ضیم اولامر یحاوله |
| اذا حل احیاً الاحیف حوله | بذی نجب لجاته و صواهله |

واتاکەی: بۆ لەناوبردنی ستەم یا کارێك کەمەبەستی ئەنجامدانی هەیە، کام کەسە وەك حێسن بێت و کام کەس وەك ئەو رودەکات گۆڕەپانی شەڕ؟ ئەو کاتەی تیرەکانی هاوپەیمان لەدەوری کۆبوونەوە، ئەمە لەزی ئەجەب رویدا کە شەڕکەران سوار لەسەر چوارپێ شەڕکەرەکان و ئەسپانی شەڕکەر سوار بوون.

کاتێك هەواڵی ئەم کارە بەتەمیمەکان گەشت، داوای هاوکاریان لەمناڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە کردو ئەوان هاوکاریان کردن. فەرماندەی مناڵەکانی تەمیم حاجب کوڕی زەرارە بوو. عامر کوڕی سەعسەعەیان بە(جواب) دنیاگەڕ ناودەبرد و ناوی ئەو مالك کوڕی کەعب لەمناڵەکانی ئەبی بەکر کوڕی کەلاب بوو چوونکە جواب، مناڵەکانی جەعفەری بەرەو لای مناڵەکانی حارس و مناڵەکانی کەعب دەرکردبوو و ئەوان ببوونە هاوپەیمانی ئەوان. دەستەیەك دەڵێن: سەرکردەی عامر شورەیح کوڕی مالیکی قوشەیری بوو. دوو سوپا بەرێکەوتن و لەنێسار چاویان بەیەك کەوت و بۆ شەڕ وەستان. عامریەکان خۆڕاگریان کرد و لەبەر ژمارەی کوژراوەکانیان زیادی کرد. تەمیمیەکان لێك پچڕان و تەندروست رزگاریان بوو و ژمارەیەکی ئەوتۆیان لێنەکوژرا. شورەیحی قوشەیری سەرکردەی عامرییەکان و عوبەید کوڕی معاویە کوڕی عەبدوللە کوڕی کەلاب و کەسانیتر کوژران. ژمارەیەك لەژنانی گەورەزادەکانی مناڵەکانی عامیر ئەسیر کران کە لەناو ئەوان دەتوانین سەلی کچی موخەلەف و عەنقا کچی هەمام ناو ببەین. سەلی ئەم قسانەی بۆ سەرکۆنە کردنی (جواب) عامیر کوڕی سەعسەعە کرد:

| | |
|---|---|
| لحى الاله ابا ليلى بفرته | يوم السنار و قنب العير جوابا |
| كيف الفخار و قد كانت بمعترك | يوم النسار بنو ذبيان اربابا |
| لم تمنعوا القوم ان اشلوا سوامكم | ولا النساء و كان القوم احرابا |

واتاکەی: خوا باوکی لەیلی ریسوا بکات کە لەشەڕی نێسار پشتی کردە دوژمن و هەڵات. هەروەها ریسوا بکات پێستی نێرینەی کەری جواب. چۆن دەتوانی شانازی بەخۆت بکەیت کەئەم هەڵاتنە لەرۆژی شەڕدابوو، رۆژی شەڕی نێسار کەمناڵەکانی

زوبیان خاوەنەکانی بوون. ئەو خەڵکانەی چوارپێکانی ئێوەیان بۆ پێشەوە دەبرد و تالآنیان کرد و ژنانی ئێوەیان لەدەستی خۆیان گرفتار کرد، رێگەتان لێ نەگرتن و لەنشینگەی خۆتان دورتان نەکردنەوە.

پیاوێکیتر بۆ سەرکۆنەکردنی جواب و توفەیل بۆ هەلآتن لەدوو هاوسەرەکەی، ئەمەی وت:

و فرعن ضرتیه و جه خارئة          و مالك فر قنب العیر جوابا

واتاکەی: ئەو بەروخسارێکی گلآو بەپیسی لەبەرابەر دوو ژنەکەی رایکرد. مالیکیش رایکرد یانی ئەو دنیاگەڕە کە لەپێستی کەرێکی نێر دەچێت، هەلآت.

قنب: پێستی نێرینەیە. جواب ناوێکی دیکەیە بۆ مالیك.

لەبەر ئەمە بەم ناوە بانگیان دەکرد چوونکە بەدنیادا دەگەڕا یانی شوێنی پێی هەلآتوانی هەڵدەگرت و دەیدۆزینەوە. بیشری کوڕی ئەبی خازم سەبارەت بەشکستی حاجب وتی:

و افلت حاجب جوب العوالی          علی شقراء تلمع فی السراب
و لو ادرکن راس بنی تمیم          عفرن الوجة منه بالتراب

واتاکەی: حاجب رویکردە (جوب العوالی) و هەلآت، سوار ماینێکی سورموو بوو کە لەناو تراویلکەدا دەدرەوشایەوە. ئەگەر ئەوان سەرکردەی تەمیمیەکانیان دەست دەکەوت روخساریان لەزەوی دەدا.

شەڕی نێسار دوای شەڕی جەبەلە بوو کەلەقیت کوڕی زەرارە تیایدا کوژرا.

کاتێک ساڵێک لەشەڕی نێسار تێپەڕی، ئەو عەرەبانەی لەم شەڕەدا ئامادەبوون، کۆبوونەوە، سەرکردەکانیان لەشەڕی جێفار هەمان سەرکردەکانی شەڕی نێسار بوون. جگە لەوەی بەوتەی هەندێ کەس، سەرکردەی مناڵەکانی عامر لەم شەڕە عەبدوللە کوڕی جەعدە کوڕی کەعب کوڕی رەبیعە بوو. دوو لەشکر لەجێفار روبەڕوی یەك بوونەوە و بۆ شەڕ ریزیان بەست. شەڕی جێفاریان بە(صیلم) بوونیاد روخێن ناوبردووە چوونکە لەم شەڕەدا پیاوانی زۆر کوژران. بێشر کوڕی ئەبی خازم سەبارەت بەپشتیوانی گەرم و دەمارگیریانەی تەمیمییەکان لەعامرییەکان وتویەتی:

| | |
|---|---|
| عصبت تميم ان يقتل عامر | يوم النسار فاعقبووا بالصيلم |
| كنا اذا نفروا لحرب نفرة | نشفی صداعهم براس صلدم |
| نعلو الفوارس بالسيوف و نعتزی | و الخيل مشعلة النخور من الدم |
| يخرجن من خلل الغبار عوابسا | خبب السباع بكل ليث ضيغم |

واتاکەی: تەمیمییەکان گرفتاری توڕەیی بوون کەعامرییەکان کوشتار بکرێن. ئەمە لەرۆژی شەڕی نێسار بوو. کاتێك تورە بوون شەڕێکی بوونیاد روخێن بەدوای ئەوە بەرۆکی ئەوانی گرت. ئێمە بەشێوەیەك بووین کاتێك دوژمنەکانمان رویان لەشەڕ دەکرد، سەر ئێشەی ئەوانمان بەسەرێکی سەخت و بێزار نەبوو چاك دەکردەوە. بەشمشێرە دەرکێشراوەکان لەسەری سوارەکانمان دەدا و دڵی خۆمان فێنك دەکردەوە. لەم کاتەدا، سەر و سینگی ئەسپەکان لەبارانی خوێن دەدرەوشایەوە. لەناو تەپ و تۆزی گۆڕەپانی شەڕ، رو گرژ دێنەدەر بەشێوەیەك درِندەکان لەبەرابەر شێرەکانی ژیان هەڵدێن.

ئەم قەسیدەیە دێری زۆرە. هەروەها دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يوم الفجار و يوم النساء | ركانا عذابا و كانا غراما |
| فاما تميم تميم بن مر | فالفاهم القوم روبی نياما |
| و اما بنو عامر بالجفار | و يوم السنار فكانوا نعاما |

**واتـاکەی:**

**شەڕی جێفار و شەڕی نێسار بووە هۆی ئەشکەنجە و تاوانی دوژمنانی ئێمە. بەڵام تەمیمییەکان یانی منداڵەکانی تەمیم کوڕی موڕ، پیاوانی ئێمە لەکاتێکدا دەوریان گرتن کەرێگەیەکی درێژیان پێوابوو و خەوێکی قورس دایگرتبوون. بەڵام عامرییەکان، لەشەڕی جێفار و شەڕی نێسار هاوشێوەی وشترملەکان لەبەردەم پڵنگەکان هەڵاتن.**

## شەڕی سەفەقە و کولابی دووەم

هۆکاری شەڕی سەفەقە ئەوە بوو بازان فەرماندار و نوێنەری خوسرەو پەرویز لەیەمەن، کاروانێك لەسامانەکان و دیاریەیکانی بۆ دەرباری خوسرەو نارد. کاتێك کاروان گەشتە شوێنێك بەناوی (نەتاع) لەسەرزەمینی نەجد، تەمیمیەکان هێرشیان کردە سەری و نێردراوان و ئەسوارانی خوسرەویان تالان کرد. تالان کراوەکان، ڕۆشتنە لای هودە کوڕی عەلی حەنەفی فەرمانداری یەمامە. ئەو ڕێزی لێ گرتن و جل و بەرگی پۆشاندن. پێشتر هەر جارێك خوسرەو پەرویز کاروانێك لەمادە بۆنخۆشکەرەکان و کالاً دەگمەنەکان و پارچە گرانباییەکانی بۆ یەمەن دنارد تا لەوێ بیانفرۆشێت، هوزە کوڕی عەلی حەنەفی، ساز وبەرگ و کەرەستەی شەڕ و باروبنەی دەبەخشی بەنێردراوانی خوسرەو و پەنای دەدان و ڕێزی لێدەگرتن. خوسرەو خوازیاری ئەوە بوو ببینێت و پاداشتی کارەکانی بداتەوە. کاتێك لەم دواییینە جار چاکەی لەگەڵ ئەو کەسانە کرد کەگرفتاری تەمیمییەکان ببوون، پێیان وت: شای شاکان بەردەوام باسی تۆ دەکات و خوازیاری ئەوەیە بڕۆیتە سەردانی. ئەو لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت. کاتێك گەشتە لای شای شاکان، ڕێزی لێگرت و گفتوگۆی لەگەڵدا کرد تا هەست بەناستی زانین و عەقڵی بکات. شای شاکان ئەو شتانەی لێبینی کەبووە هۆکاری شادمانی. لەبەر ئەمە فەرمانیدا و زێر و سیمی فراوانیان پێدا و تاجێك لەتاجەکانیان خستە سەر.

هوزە پیاوێکی مەسیحی بوو. خوسرەو فەرمانی پێدا هاورێ لەگەڵ موکەعبەر و سوپایی شایی بڕواتە شەڕی تەمیمییەکان. ئەوان بەرێکەوتن و لەموشەقەر دابەزین. موکەعبەر و هوزە لەڕۆشتنە ناو سەرزەمینی تەمیمییەکان ترسان چوونکە خەڵکانی ئەوێ قەلاً نشین بوون و ئێرانییەکان نەیاندەتوانی بەسەریاندا زاڵ بن. لەبەر ئەمە، چەندین پیاویان لەمناڵەکانی تەمیم نارد و ئەوانیان بۆ میوانی بانگ کرد. ساڵێکی سەخت و دژوار بوو. ئەوان سوار هەر چوارپێ و ئەسپ و وشترێك بوون و بەپلە رویان کردە میوانییەکە. موکەعبەر ئەوانی پێنج پێنج یا دە دە یا زیاتر و کەمتر

لەدرگایێکەوە دەبردە نا و وای نیشان دەدا لەدرگاییێکیتر دەیانکاتەدەر. هەر کەس دەڕۆشتە ناو لەملی دەدا. کاتێك ئەم کارە درێژی کێشا و بینیان هەر کەس دەڕواتە ناو و نایێتە دەرەوە، چەندین پیاویان نارد تا لەم کارە ئاگادار ببنەوە. پیاوێك لەعەبەس بەدژواری رۆشتە پێش و زنجیری پچڕاند و ئەو کەسانەی لەناوەوە بوون هێنایە دەر. موکەعبەر فەرمانیدا دەرگاکان ببەستن و هەموو خەڵکانی ناو شار بکوژن. ئەو رۆژە جەژنی (فصح) بوو. هوزە داوای گیانی سەد کەسی لەموکەعبەر کرد کەموکەعبەر ئەوانی پۆشاند و لەرۆژی جەژنی فصح ئازادی کردن. ئەعشا لە قەسیدەیەك بۆ وەسف کردنی هوزە دەڵێت:

بها یقرب یوم الفصح ضاحیة          یرجوالاله بما اسدی و ما صنعا

واتاکەی: لەوێ لەرۆژی فصح چەندین قوربانی هێنایە درگای خواوەند، لەم کارە چاکەی ئەنجامیدا، تەنیا چاوی لەپاداشتی خواوەند بوو.

لەسەر ئەم بنەمایە رۆژی (مشقر) بوو بەپەند. ئەمە هەمان رۆژی سەفقەیە ( لێکدان، بەریەك کەوتنی دەست و درگا و هاوشێوەکانی) چوونکە درگا کرایەوە و بەسترا. شەڕی سەفقە کاتێك رویدا کەپێغەمبەر بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردرابوو بەڵام بۆ مەدینە کۆچی نەکردبوو.

بەڵام داستانی شەڕی کەلابی دووەم بەم شیوە بوو: پیاوێك لەمناڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە لەسەرزەمینی نەجران رۆشتە لای مناڵەکانی حارس کوڕی کەعب کەخاڵەکانی بوون. لەو سەبارەت بەو خەڵکەی بەجێی هێشتوون، پرسیاریان لێکرد. پێی وتن: درگای مشقر لەسەر مناڵەکانی تەمیم داخراوە و پیاوە شەڕکەرەکانیان کوژراون و ژن و مناڵ و سامانەکانیان لەناو ماڵە بێ بەرگریکارەکان بەجێ ماون. لەبەر ئەمە مناڵەکانی حارس لەمزحەج و هاوپەیمانەکانی لەنەهد و جەرم کوڕی رەبان سوپایەکی گەورەیان کۆکردەوە کەژمارەی پیاوە شەڕکەرەکانی دەگەشتە هەشت هەزار کەس. لەسەردەمی جاهلی، لەم سوپایە و سوپای خوسرەو لەشەڕی زی قار و لەشکرییەکانی شەڕی جەبەلە، سوپایەکی گەورەتر نەبینرابوو. هەموویان بۆ شەڕی

تەمیمییەکان بەرێکەوتن. کاهینێک بەناوی سەلە کوڕی موغەففەل لەمناڵەکانی حارس وشیاری دایە ئەوان کەشەڕی تەمیمیەکان نەکەن. ئەو بەشێوەی ئەو رۆژگارەی کاهینەکان، بەوتەی مەبەستدار پێی وتن: ئێوە بە ئاشکرا دەڕۆن نە لەشەوی ڕەش، شەڕی بەردەوام ناکەن بەڵکو سات نا ساتێك شەڕ دەکەن لەگەڵ سەعد و ریانی بێ پەنا، لەسەر ئەو ئاوانە دادەبەزن، خۆراگرن و بەهێزن خوازراو و نەخوازراو، شەڕ دەکەن لەگەڵ ئێوە لەبەرەبەیانەوە تا ئێوارێ، بەهەرمیەك بەدەست ناهێنن مەگەر خاك، ببیستن ئامۆژگاری پیاوێکی ئاگا، بگەڕێنەوە لەشەڕی تەمیمییەکان تا نەکەونە ناو چاڵ. ئەوان گوێیان لەئامۆژگارییەکەی نەگرت و درێژەیان بەرێگای خۆیان دا. ئەم هەواڵە بەتەمیمیەکان گەشت. پیاوە زاناکانی ئەوان لای ئەکسەم کوڕی سەیفی کەلەو کاتەدا سەد و نەوەد ساڵ تەمەنی بوو، کۆبوونەوە. پێیان وت: ئەی باوکی جیدە، ئەم کارە بە ئەنجام بگەیێنە کەئێمە تۆمان بەسەرکردەی خۆمان هەڵبژاردووە. وتی:

و ان امرا قدعاش تسعين حجة — الى مائة لم يسام العيش جاهل
مضت مائتان غير عشر و فاؤها — و ذلك من عد الليالى قلائل

واتاکەی: پیاوێك کە سەد و نەوەد ساڵ بژیت و لەژیان بێزار نەبێت، نەزانە. دوسەد ساڵ جگە لەدەساڵی سەراسەر، بەسەر چوون و ئەمە لەناو شوماری زەمان کەمە.

دواتر وتی: پێویستم بەسەروەری نییە بەڵام بۆ ئێوە بەباشی دەزانم مناڵەکانی حەنزەلە کوڕی مالیك لەدەهنا بێستن و سەعد کوڕی زەید مەنات و رەباب، یانی هەمان زەببە ئود و سور و عەکەل و عودەی مناڵەکانی عەبد مەنات کوڕی ئود، لەکەلاب جێگە بگرن. هەرکام لەم دوو رێگا دوژمن بیگرێتە بەر، هەر یەك لەم دوو سوپایە لەوێ خۆراگری بکات و قورسایی شەڕ لەسەر شانی سوپاکەی تر هەڵبگرێت. ئەوکات پێی وتن: گوێ لەئامۆژگاری من بگرن، ژنانە مەهێنن بۆ ناو گۆڕەپانی شەڕ

کەپیاوانی پەست پشت دەکەن دوژمن و ژنان بۆ دوژمنان بەجێ دێڵن، ناسازگاری لەگەڵ فەرماندەکانی خۆتان وەلابنێن، لەهاوار کردنی زۆر لەشەڕ خۆ بپارێزن کەئەمە خۆی نیشانەی سستییە، پیاو خوازراو و نەخوازراو سست و ناتەوان دەبێت، نەزانانەترین کارەکان خراپەکارییە و وشیارترینی وشیارەکان خۆپارێزن، لەوتار و کردار هاودەست و یەکدڵ بن چوونکە کار بەکۆمەڵەکان بەسەرکەوتن کۆتایی دێن، لەناسازگاری خۆبەدوور بگرن کەهەر کەس گیرۆدەی بەربلاوی بێت، شکست دەخوات، ئەزۆر درەنگ بگەن ئەزۆر بەپەلە بن کە لەناو دوو سوپای شەڕکەر ئەوەی ئارامتر و خۆارگرتر بێت، سەرکەوتن بەدەست دێنێت و چەند زۆر ئەو پەلە کردنانەی کارەکان خاو دەکەنەوە. کاتێك براکەت سەرئەفرازی بکات، تۆ سەر دانەوێنە. جل و بەرگی پڵنگ بپۆشن و وەك شێری ژیان برۆنە گۆڕەپانی شەڕ، شەو بکەنە زرێ و قەڵغانی خۆتان و سوار بن چوونکە شەو هەموو شتێك دادەپۆشێت، خۆراگری لەبەهێزی باشترە، بەچێژترین سەرکەوتن، فراوانی دیلەکانە و باشترین تالآنییەکان، گرتنی سامانە بێ کۆتاییەکان، لەشەڕ لەمەرگ مەترسن کەروبەرو و لەپشت سەری ئێوەیە و دڵدان بەیار لەکاتی شەڕ هۆکاری هەڵە و لاوازییە. باشترین فەرماندەکانی ئێوە ئەعمان کوڕی مالیك کوڕی حارس کوڕی جەساسە کە لەمناڵەکانی تەمیم کوڕی عەبد مەنات کوڕی ئودە. ئەوان گوێیان لەبۆچوونەکانی گرت و مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی حەنزەلە لەدەهنا جێگەیان گرت و سەعد و رەباب و مزحەج و هاوەڵانی لەقوزاعە رویان کردە کولاب. هەواڵی ئەم کارە بەسەعد و رەباب گەشت. کاتێك مزحەجییەکان نزیك بوونەوە، شمیت کوڕی زەنباعی یەربوعی ئەوانی ئاگادار کردەوە. ئەو سوار وشترەکەی خۆی روی کردە سەعد و هاواری کرد: ئای خەڵکینە! دوژمنان گەشتن، ئەی مناڵەکانی تەمیم، دێو سرشتەکان هاتن. خەڵك راپەڕین. مزحەجییەکان روویان کردە چوارپێکان و خەڵك ئەوانیان تالآن کرد و شێعرخوێنەکەیان ئەمەی دەخوێند:

فی کل عام نعم ننتابه    علی الکلاب غیبت اصحابه

یسقط فی آثاره غلابه

واتاکەی: ساڵانە ئەو چوارپێیانە هەن کەدەورمیان دەگرین، لەسەرزەمینی کولابن و خاوەنەکانیان لێیان دور. سەرکەوتوو شوێن ئەوان دەکەوێت

لەم کاتەدا قەیس کوڕی عاسمی مێنقەری و نەعمان کوڕی جەساس و مالیك کوڕی مونتەفیق لەگەڵ خەڵکەکەی خۆیان بەپەلە گەشتن. قەیس لەوەڵامی ئەو شێعر خوێنەدا وتی:

عما قليل تلتحق اربابه　　مثل النجوم حسرا سحابه
ليمنعن النعم اعتصابه　　سعدوفرسان الوغى اربابه

واتاکەی: بەزووی خاوەنەکانیان دەگەن، هاوشێوەی ئەستێرەکانن کەهەورەکان لەبەرابەر ئەوان خۆیان لا دابێت.

ئەوسا قەیس هێرشی کردە سەریان و ئەمەی وت:

فى كل عام نعن تحوونه　　يلحقه قوم وتنتجونه
اربابه نوكى فلا يحمونه　　ولايلاقون طعانا دونه
انعم الابناء تحسبوونه　　هيهات هيهات لما ترجونه

واتاکەی: هەر ساڵە چوارپێیانێك هەن کەئێوە دەوریان دەگرن، پیاوانێك ئەوان دەگرن و ئێوە لەسەر ڕێگاکانیان دادەنیشن، ئەوان لەبەرابەر ئەم کارە خۆراگری ناکەن. ئایا ئەوان بەچوارپێکانی بنەماڵەی خۆتان دەزانن؟ دوورە دوور، ئەوەی چاوی تەماحتان تێبڕیوە.

لەو ڕۆژەدا تەمیمیەکان بەسەختی شەڕیان کرد و سەراسەری ڕۆژیان لەجەنگدا

بەسەر برد. دواتر یەزید کوڕی شەنان کوڕی قینانی حارسی هێرشی کردە سەرنەعمان کوڕی مالیك کوڕی جەساس و تیرێکی بۆ هاویشت و ئەوی لەناو برد. فەرماندەیی گەشتە قەیس کوڕی عاسیم. ئەوەندە شەڕیان کرد تا شەو جیایی خستە نێوانیان. شەویان تا بەیانی بەچاودێری کردنی یەکتر کردە ڕۆژ و کاتێك بەرەبەیان هات، شەڕیان دەست پێکردەوە. قەیس کوڕی عاسیم و مزحەجیەکان سوار بوون. تەمیمیەکان لەڕۆژی پێشتر زیاتر شەڕیان کرد. یەکەم کەس لەمزحەجییەکان کەشکستی خوارد، مودریج ئەلریاح یانی عامیر کوڕی مەجون کوڕی عەبدوللە جەرەمی ئالأدارەکەیان بوو کەئالأی فڕێدا و هەلأت. پیاوێك لەمنالّەکانی سەعد گەشت و ئەسپەکەی ئەوی کوشت. ئەو دابەزی و بەراکردن هەلأت. قەیس کوڕی عاسیم هاواری کرد: ئەی تەمیمیەکان، ڕوو لەسوارەکان بکەن و واز لەپیادەکان بێنن. ئەوان خۆیان گرفتاری ئێوەن. ئەو گرتن و بەستنەوەی ئەسیرەکانی دەست پێکرد.

عەبد یەغوس کوڕی حارس کوڕی وەقاسی حارسی سەرکردەی مزحەجییەکان ئەسیر کرا و لەبەرابەر نەعمان کوڕی مالیك کوڕی جەساس کوژرا. عەبد یەغوس پیاوێکی شاعیر بوو. پێش کوشتنی زمانیان بەست تا خراپەیان نەڵێت. ئەو بە نیشارە ئەوانی تێگەیاند تا زمانی بکەنەوە و بەڵێنی دا خراپەیان نەڵێت. کاتێك زمانیان کردەوە، وتی::

| | |
|---|---|
| الا لا تلومانی کفی اللوم ما بیا | فما لکما فی اللوم نفع و مالیا |
| الم تعلما ان الملامة نفعها | قلیل و ما لومی اخا من شمالیا |
| فیاو اکبا اما عرضت فبلغن | نداmای من نجران الا تلاقیا |
| ابا کرب و الا یهمین کلیهما | وقیسا باعلی حضرموت المانیا |
| اقول و قد شدوا لسانی بنسعة | معاشرتیم اطلقوا من لسانیا |
| کانی لم ارکب جوادا و لم اقل | لخیلی کری کرة من ورائیا |
| ولم اسباؤ الزق الروی ولم اقل | لایسار صدق عظموا ضوء ناریا |
| و قد علمت عرسی ملیکة اننی | انا اللیث معدوا علیة و عادیا |
| لحی الله قوما بالکلاب شهدتهم | صمیمهم و التابعین الموالیا |
| و لو شءت نجتنی من القوم شطبة | تری خلفها الکلمت العتاق توالیا |

و كنت اذا ماالخيل شمصها القنا لبيقا بتصريف القناة بنانيا

فيا عاص فك القيد عنى فاننى صبوور على مر الحوادث ناكيا

فان تقتلونى تقتلوا بى سيدا و ان تطلقونى تحربوونى ماليا

واتاکەی: های ئەی دوو یاری نازەنینی من، سەرکۆنەم مەکەن چوونکە ئەوەی بەسەرم هاتووە. بەسمە و پێویستم بەسەرکۆنەکردن نییە و نەنێوە لەسەرکۆنە کردن سودێکتان دەست دەکەوێت، نەمن. ئایا نازانن سوودی سەرکۆنە کردن کەمە؟ چ سوود لەوەی برادەرێك لای خۆم سەرکۆنە بکەم؟ ئەی پیاوی سوارکار، ئەگەر رێت کەوتە سەرزەمینی من، بەدوو هاوپیاڵەکەی من لەنەجران بڵێ: بێ من لەسەر سفرەی بادە خواردنەوە دامنیشن، باوکی کرب و هەردوك (ئەیهەم)، و قەیس کە لەحەزرەموت لەسەرەوەی یەمەن جێگایان هەیە، لەمنەوە سڵاو بۆ هەموویان بێت. ئێستا لەکاتێکا زمانی منیان بەرشتەیەك پێست بەستۆتەوە، دەڵێم: ئەی دەستەی تەمیمییەکان، زمانی من بکەنەوە، وەك بڵێی من سوار سەمەندی تیژپێ نەبووم، دەڵێی بەئەسپی تیژ پێ و چالاك و سوارانی ژێر دەستی خۆم فەرمانم نەداوە: شوێنم کەون و بەدوای مندا هێرش بکەن. دەڵێی مەشکی پڕ بادەی بەتامم بۆ خواردنەوە نەکڕیوە، بەتاوڵە بازانی دەوروبەری خۆم نەوتووە، ئاگری میوانخانەکەی من گەرمتر بکەن و گەورەتر تا میوانی زیاتر روی تێبکەن. ژنە گەنجەکەم خاتوو(مەلیکە) باش دەزانێت من شێری ژیانم، چ ئەسیر بم چ ئازاد، چ گرفتار بم چ ئامادەی شەڕ، خوا ناشیرین کات ئەو خەڵکانەی لەسەرزەمینی کەلاب چاوم پێیان کەوت، چ ئازادەکانی ئەوان، چ بەردەکانیان و چ پەیوەندیدارەکان بەوان. ئەگەر دەمویست ئەسپە گەنجەکەم بەدوای ئەو ئەسپە سور و سپی و رەسەنانەوە بێت، منی لەم گێژاوە رزگار دەکرد. بەشێوەیەك بووم کاتێك سوار چوارپێکان دەبووم و ئەسپەکانم بەرمەکان غاردەدا، پەنجەکانم لەسوڕاندن و کارکردنی رم لەهەر کەسێك نەرمتر و بەئەزموتر بوو. ئێستا ئەی عاسیم، بەندی من بکەرەوە کەمن بۆ بەسەر بردنی پێشهاتە گیانبڕەکان خۆڕاگر و بەتاقەتم. ئەگەر بمکوژن سەروەرێکی گەورەتان کوشتبێت و ئەگەر ئازادم بکەن هەموو سامانەکانی من بەدەست دێنن.

باوکی کرب بێشر کوڕی عەلقەمە کوڕی حارسە و دوو ئەیهەم ئەسوەد کوڕی کوڕی عەلقەمە کوڕی حارس و عاقب یانی عەبدئەلمەسیح کوڕی ئەبیەز و قەیس هەمان قەیس کوڕی مەعدی کەربە. مێژوو نوسان گومانیان بردووە قەیس وتویەتی: ئەگەر ناوی منی لەسەرهتاوە وپێش ناوی کەسانیتر دەهێنا هەموو سامانەکەی خۆم دەکردە بەهای ئازادی ئەو. ئەو کوژرا و بەبەهای ئازادییەکەی رازی نەبوون.

## شەڕی زەهروئەلدەهنا

ئەم شەڕە لەنێوان تەی و ئەسەد کوڕی خەزیمە رویدا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو ئەوس کوڕی حارسە کوڕی لامی تایی لەنێوان خەڵکەکەی خۆی سەروەرێکی فەرمانڕەوا، بەخشەرێکی بەدڵ و لەکارەکان پێشەنگ بوو. لەگەڵ حاتەمی تایی ڕۆشتنە لای عەمرۆ کوڕی هیند (پاشای عەرەب). ئەو ئەوسی بانگ کرد وپێی وت: تۆ لەپێشتری یا حاتەم؟ ئەوس وتی: ئەی پاشا، لەنفرین بەدور بیت، حاتەم تاقانەی هۆزە و من یەکێك لەخەڵکانی هۆز. ئەگەر حاتەمی تایی من و منداڵەکانم و خزمەکانمی لەدەستا بووایە، لەیەك ڕۆژدا دەیبەخشین. دوای ئەو حاتەمی بانگ کرد و پرسی: تۆ لەپێشی یا ئەوس؟ حاتەم وتی: لەنفرین بەدوور بیت، باسی ئەوست کرد کەتەنانەت یەکێك لەمنداڵەکانی لەمن لەپێشترە. قسەکانی ئەوان بووە هۆی دڵخۆشی ئەو، پاداشت دانەوە و ڕێزی گرتن.

دواتر دەستەی نوێنەرانی عەرەب لەهەر تیرەیەك لای نەعمان کوڕی مونزەر کۆبوونەوە و ئەوس لەناویاندا بوو. ئەو جلێکی جوانی لەجلی شایانە داوا کرد و بەنوێنەرانی وت: بەیانی وەرنەوە کەئەم جل و بەرگە دەکەمە بەری ڕێزدارترینی ئێوە. کاتێك بەیانی گەشت، هەموویان جگە لەئەوس هاتن. پێیان وت: بۆ نەهاتیت؟ وتی: ئەگەر مەبەستی پاشا کەسێك جگە لەمن بێت هەمان باشتر کە لەوێ نەبم و ئەگەر مەبەستی من بێت بەدوامدا دەنێرێت. کاتێك نەعمان لەسەر تەخت دانیشت و ئەوسی نەبینی، وتی: بڕۆنە لای ئەوس وپێی بڵێن: وەرە ئێرە کەلەوەی دەترسیت لەنەماندایت. ئەو هات و پاشا جلی شاهانەی لەبەر کرد. خەڵکێك لەکەسانی خۆی رژدیان پێبرد وبەحەتینەیان وت: خراپەی ئەو بڵێ تا سێسەد وشترت بدەینێ. وتی: چۆن خراپەی پیاوێك باس بکەم کەهەرچی سامان و ساز وبەرگ و باروبنە لەماڵەکەمدایە هی ئەوە؟ دواتر وتی:

کیف الهجاء و ماتنفك صالحة      من اهل لام بظهر الغيب تاتيني

واتاکەی: چۆن خراپەی بنەماڵی (لام) بڵێم کەهەر رۆژ چاکەیەکی تازە لەوان بەمن دەگات.

لەم کاتەدا بێشر کوڕی ئەبی خازم بەوانی وت: من بۆ ئێوە خراپەی ئەو دەڵێم، وشترەکان بدەن بە. ئەو خراپەی وت و ئەوان وشترەکانیان پێدا. ئەو لەخراپە وتنی خۆی وشەی ناشیرین و قێزەونی بەکار برد و بەخراپی لەدایکی، یانی سەعدی، ئاخاوت. کاتێك ئەوس ئاگادار بوویەوە، هێرشی کردە سەر وشترەکان و هەموویانی گرت. ئەوس بەدوایدا گەڕا وبێشر رایکرد و پەنای بردە هۆزکەی خۆی مناڵەکانی ئەسەد کەرێزیان گرت و تەسلیم کردنی ئەویان بەدوژمن بەشەرم دەزانی. ئەوس پیاوانی شەڕکەری هۆزی تەی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان ڕۆشتە شەڕی مناڵەکانی ئەسەد. روبەرووبوونەوە لەدەهنا لەبەرابەر تیما رویدا و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. مناڵەکانی ئەسەد شکستیان خوارد و بەسەختی کوشتار کران. بیشر رایکرد بەلام پەنای دەبردە بەر هەر هۆزێك و داوای هاوکاری کرد، لەوەرگرتنی ئەولەبەرابەر ئەوس خۆیان بەدوور گرت. دواتر ڕۆشتە لای جیندەب کوڕی حیسنی کەلابی لەسەرەوەی (سەمان). ئەوس کەسێکی نارد و بێشری داوا کرد. ئەو بێشری بۆ لای ئەوس نارد. کاتێك بێشر گەشت خەڵکەکەی پێشنیاریان کرد بیکوژێت. ئەوس ڕۆشتە لای دایکی خۆی سەعدی و خوازیاری بۆچونی ئەوبوو. ژنی فرمزان پێشنیاری بەکوڕەکەی خۆی کرد سامانەکانی ئەو (وشترەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە) و لێی خۆشبێت و رێزی لێبگرێت چوونکە خراپە وتنی ئەو تەنیا بە رێز گرتن و وەسف کردنی خۆی دەتوانێت وەڵامی بدرێتەوە. بۆچونەکەی دایکی پەسەند کرد و ڕۆشتە لای بێشر وتی: ئەی بێشر گومان دەکەی لەگەڵ تۆ چی دەکەم؟ بێشر وتی:

| | |
|---|---|
| انی لارجو منك یا اوس نعمة | و انی لاخری منك یا اوس راهب |
| و انی لا محو بالذی انا صادق | به کل ما قد قلت اذانا کاذب |
| فهل ینفعنی الیوم عندك اننی | ساشکر ان انعمت والشکر واجب |
| فدی لابن سعدی الیوم کل عشیرتی | بنی اسد اقصاهم و الاقارب |
| تدارکنی اوس بن سعدی بنعمة | و قد امکنته من یدی العواقب |

واتاکەی: ئەی ئەوس من هیوای لێخۆشبوونم لەتۆهەیە بەڵام لەهەمان کات لەو کارەی تر(کوژران) دەترسم. ئێستا قسەی راست و دروست دەڵێم و ئەوەی بەدرۆ وتبووم بەقسەی پاکی خۆم راست دەکەمەوە. ئایا ئەمرۆ ئەمە لای تۆ سود بەمن دەگەیێنێت کەبەردەوام سپاسگوزاری تۆدەبم چوونکە سپاس کردن کارێکی پێویستە. فیدایی کوڕی سەعدی بن هەموو کەسەکانی من لەمناڵەکانی ئەسعد، هەموو ئاسراوە نزیك و دورەکانم و هەموو خزمەکانم. ئەوس کوڕی سەعدیَ کاتێك لەمن خۆشبوو کە دەستم بەستراوەو و بۆ هەر سزایەك شیاو بووم.

ئەوس منەتی بەسەردا کرد و ئەوی سوار ئەسپێکی ڕەسەن کرد، ئەوەی لێسەندبوو بۆی گەڕاندەوە و لەسامانەکەی خۆی سەد وشتری بۆ زیاد کرد. بێشر وتی: بەناچار تا ئەو رۆژەی زیندوو بم، جگە لەتۆ وەسف کەس ناکەم. دواتر ئەوی بەقەسیدەیەکی دورودرێژ و ناوداری خۆی وەسف کرد کەسەرەتاکەی بەمشێوەیە:

| | |
|---|---|
| اتعرف من هنيدة رسم دار | بحرجى ذروة فالى لواها |
| و منها منزل ببراق خبت | عفت حقبا و غيرها بلاها |

واتاکەی: ئایا پاشماوەکانی ماڵی دڵدارەکەی من هیندە بیر دێنیتەوە؟ لەبەرزایی لوتکەی کێوێك با لەولای شوێنی سوڕانەوەیەتی. هەروەها ماڵێکی لەسەرزەمینی (براق خبت) هەیە، ماڵێك کەرۆژگاری درێژ و ئەزمونەکانی کۆنیان کردووە و ناو ونیشانەکەیان لەبناغەکەی سڕیوەتەوە.

ئەم قەسیدەیە دور و درێژە.

## شەڕی وەقیت

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو لەهازیم کۆبوونەوە تا لەناکاو هێرش بکەنە سەر تەمیمیەکان و ڕێگەنەدەن ئەوان لەهیچ ئاگادار ببنەوە. لەناو ئەوانەی کۆببوونەوە دەتوانین ئاماژە بەمانە بدەین: قەیس، تیم ئەللات کوڕانی سەعلەبە کوڕی عوکابە کوڕی سەعب کوڕی عەلی کوڕی بەکر کوڕی وایل، هاوڕێ لەگەڵ عێجل کوڕی لوجەیم و عەنزە کوڕی ئەسەد کوڕی ڕەبیعە کوڕی نزار. پیاوی یەك چاو یانی ناشب کوڕی بەشامەی عەنبەری کە لەناو منداڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە ئەسیر بوو، ئەمەی بینی. بەوانی وت: کەسێك بەمن بدەن تا بینێرم بۆ لای کەسەکانی خۆم و نیازەکانی خۆم لەوان داوا بکەم. وتیان: بەبوونی ئێمە قسەی لەگەڵ دەکەیت؟ ناشب وتی: بەڵێ، لاوێکیان هێنا. ناشب وتی: نەزانێکتان بۆ لای من هێناوە! کوڕ وتی: سوێند بەخوا نەنەزانم نەحۆل. ناشب وتی: کەواتە شێتیت! کوڕ وتی: شێت نیم. ناشب وتی: بیرمەندی؟ کوڕ وتی: بەڵێ، بیرمەندم. ناشب وتی: ژمارەی خۆر و مانگ زیاترە یا ئەستێرەکان؟ کوڕ وتی: ئەستێرەکان، بەڵام هەموویان گەورەن. ناشب دەستی خۆی پڕ کرد لەزیخ وتی: لەدەستی مندا چەند دەنك زیخ هەیە؟ کوڕ وتی: زۆرە، ژمارەکەی نازانم. ناشب خۆری بەپەنجە نیشاندا و پرسی: ئەوە چییە؟ کوڕ وتی: خۆرە. ناشب وتی: کەواتە تۆ بیرمەندی. بڕۆ لای خەڵك و کەسەکانی من و سڵاویان بگەیێنە و بڵێ لەگەڵ ئەسیرەکانی خۆیان بەباشی هەڵس وکەوت بکەن کەمن لەناو خەڵکێکدا ئەسیرم کە بەباشی هەڵس وکەوتم لەگەڵ دەکەن و ڕێزم دەگرن. بڵێ سوار وشترە موو سورەکەی من ببن و وشترە سپی و کەوەییەکی من بۆ خۆیان بەجێ بێڵن و نیازەکانی من لای منداڵەکانی مالیك بەجێبێنن. ئەوان ئاگار بکەرەوە کە (عوسج(چقڵی دار) گەڵای کردووە، ژنان (اشتکا) (گلەیی، ڕەنج) یان هەیە. لەفەرمانی هەمام کوڕی بەشامە سەرببێچن چوونکە پیاوێکی شوومە و لەئێمە دابڕاوە. فەرمانی هەزیل کوڕی ئەخنەس ببەن کەپیاوێکی دوورئەندێش و پیرۆزە و هەواڵی بەسەرهاتی من لەحارس بپرسن.

کوڕکە هات و پەیامەکەی ئەوەی بەخەڵکەکەی گەیاند. کەس نەیزانی دەیەوێت چی بڵێت. حارسیان هێنا و ئەم هەواڵیان پێ ڕاگەیاند. بەنێردراوی وت: لەسەرەتاوە بۆم باس بکە. نێردراو هەموو بەسەرهاتەکەی لەسەرەتاوە تا کۆتایی باس کرد. حارس وتی: سڵاوی ئێمەی بۆ بەرە و بڵێ فەرمانەکانی بەجێدێنین. کوڕ ڕۆشت. دواتر حارس بەمناڵەکانی عەنبەری وت: ناشب کوڕی بەشامە هەواڵی کاری دوژمنانی بۆ ئێوە رون کردۆتەوە. ئەو زیخەی لەدەستیدا بووە نیشانەی ئەومیە لەشکریانێکی زۆر هێرش دەکەنە سەر ئێوە، خۆر نیشانەی ئەومیە ئەم کارە لەهەتاو ڕوشنترە، وشتری سور موو و دواتر کەومیی نیشانەی ئەومیە ئەو بەجێبێڵن یانی لەوێ کۆچ بکەن، وشتری سپی و کەومیی نیشانەی ئەومیە بڕۆنە دەهنا و لەوێ پەنا بگرن. مەبەستی لەمناڵەکانی مالیك ئەومیە ئەوانیش ئاگادار بکەنەوە، گەڵا دەرکردنی چقڵی دار نیشانەی ئەومیە خەڵك جلی شەڕیان پۆشیوە، داستانی (اشتکا)ی ژنان ئەومیە کەژنان (شکا)یان پینە کردۆتەوە یانی مەشکی ئاوی شەڕکەرانیان پڕکردووە و هەموو شتێك بۆ شەڕ ئامادەیە.

مناڵەکانی عەنبەر وشیار و ئاگادار بوونەوە و بەرەو دەهنا ڕۆشتن و مناڵەکانی مالیکیشیان ئاگادار کردەوە بەڵام ئەوان باوەڕیان نەکرد.

دواتر لەهازیم و عێجل و عەنزە ڕۆشتنە لای مناڵەکانی حەنزەلە و بینیان عەمرۆ پەنای بۆ کوێشتان بردووە. ئەوان لەلەقیت هێرشیان کردە سەر مناڵەکانی دارم و شەڕ لەناو ئەوان دەستی پێکرد. مناڵەکانی رەبیعە دەستەیەك لەگەورەکانی مناڵەکانی تەمیمیان بەئەسیری گرت لەناو ئەوان: زەرار کوڕی قەعقاع کوڕی مەعبێد کوڕی زوڕارە کەقژی ناوچاویان بڕی و ئازادیان کرد، عەسجەل کوڕی مەئمون زوڕارە، جومیرە کوڕی بەدر کوڕی عەبدوللە کوڕی دارم. ئەمیان ئەسیر بوو تا ئەوەی ڕۆژێك بینی ئەوان بادە دەخۆنەوە. لەم کاتەدا ئەم شێعرەی وت و ئەوان بیستیان:

| | |
|---|---|
| و قائلة ما غاله ان يزورنا | وقد كنت عن تلك الزيارة فى سفل |
| و قد ادركتنى و الحوادث جمة | مخالب قوم لاضعاف و لا عزل |

سراع الى الجلى بطاء عن الخنا　　رزان لدى الباذين فى غير ما جهل
لعلهم ان يمطرونى بنعمة　　كما صاب ماء المزن فة البلد المحل
فقد ينعش الله الفتى بعد ذلة　　و قد تبتنى الحسنى سراة بنى عجل

واتاکەی: ژنێکی جوان بەردەوام دەیوت بۆ نایێتە بینینی ئێمە، بەلأم نازانێت ئێستا گرفتارتر لەوەم سەر لەژنان بدەم و لەوان چێژ وەربگرم. لەم کاتەدا رووداوە دژوارەکان، دەستی خەڵکانێك منی گرتووە کەنەسست و ناتەوانن وخاڵی لەکەرەستەی شەڕ. بەرەو کارە دژوارەکان بەپلە دەڕۆن و لەوتاری ناشیرین بەدوورن. کاتێك بادەی (بازین) دەخۆنەوە سەقامگیر و ئارامن و لەنەزانی خۆبەدور دەگرن. ئەگەری هەیە بارانی بەخشینی ئەوان من بگرێتەوە بەهەمان شێوە کەهەوری پڕ باران دەبارێتە سەر زەوی وشك. هەندێ کات رودەدات خوا گەنجێك دوای پەستی بەشادمانی دەگەیێنێت و دەکرێت بەفەرمانی خوا، سەروەرانی منالەکانی عێجل رێگە چاکەکاری بگرنە بەر.

کاتێك ئەم قسانەی ئەویان بیست ئازادیان کرد.

هەروەها نوعەیم و عەوف کوڕی قەعقاع کوڕی مەعبێك کوڕی زورارە و کەسانیتر بەئەسیری گیران. ئەمانە لەگەورەکانی منالەکانی تەمیم بوون. حەکیم کوڕی جەزیمە کوڕی نۆسەیلەعی نەهشەلی کوژرا و لەمنالەکانی نەهشەل کەس جگە لەو بۆ ئەم شەڕە نەهاتبوو. بەکرییەکان گەڕانەوە و دوای کۆتایی هاتنی شەڕ لەسەر رێگای خۆیان سێ کەس لەعەنبەریەکانیان بینی کەلەگەڵ خەڵکەکەی خۆیان کۆچیان نەکردبوو، کاتێك ئەوانیان بینی وشترەکانی خۆیان غاردا و لەبەکریەکانیان وەرگرتنەوە.

شاعیران سەبارەت بەم شەڕە زۆریان نوسیوە. لەوانە وتارەکەی باوکی مەهوەشی فەقعەسیە کەتەمیمیەکان بۆ سستی لەشەڕی وەقیت سەرکۆنە دەکات و دەڵێت:

فما قاتلت يوم الوقيطين نهشل　　ولاالانكد الشؤمى فقيم بن دارم
و لا قضبت عوف رجال مجاشع　　ولا قشر الا ستاه غير البراجم

واتاکەی: لە دوو شەڕی وەقیت، نەهشەل شەڕی نەکرد و لەگەڵ ئەو زیاندەرە شومە فەقیم کوڕی دارم. شێر، پیاوانی موجاشعی هەڵنەدڕی، جگە لەپەنجەکانی دەست هیچ شتێك قونەکانی نەخوراند.

باوکی توفەیل عەمرۆ کوڕی خالید کوڕی مەحمود کوڕی عەمرۆ کوڕی مورسد وتی:

| | |
|---|---|
| حكت تميم بركها لما التقت | راياتنا ككو اسرا لعقبان |
| دهموا الوقيط بجحفل جم الوغى | ورماحها كنوازع الاشطان |

واتاکەی: کاتێك ئاڵاکانی ئێمە وەك هەڵۆکان گەشتنە گۆڕەپانی شەڕ، تەمیمییەکان دەستیان بەخوراندنی سینەی وشترەکانی خۆیان کرد. بەسوپایەکی گەورە رویان کردە گۆڕەپانی وەقیت و ئاگری شەڕیان هەڵایساند و ڕمەکانی ئەوان هاوشێوەی تیرە سنگ قەڵشێنەکان یا کەمەندەکان بەرشتە بڵندەکانن.

## شەڕی مەروت

ئەم شەڕە لەنێوان منداڵەکانی تەمیم و منداڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە رویدا.
هۆکاری شەڕەکە بەمشێوە بوو قەعنەبی کوڕی عەتابی ریاحی لەبازاری عەکاز چاوی بە بەحەیری کوڕی عەبدوللە کوڕی سەلەمەی عامیری کەوت. بەحەیر ب قەعنەبی وت: چیت لەئەسپە سپیەکەی خۆت کردووە؟ قەعنەب وتی: لای خۆمە، بۆ دەپرسیت؟ بەحەیر وتی: چوونکە ئەم ئەسپە لە فلاَن و فلاَن رۆژ تۆی لەدەستی من و چنگی مەرگ رزگار کرد. قەعنەب وتی: شتی وا نەبووە. ئەو دوانە دەستیان بەجوین دان و دۆعایان لەیەکتر کرد تا مەرگی درۆزن لەسەر دەستی راستگۆ بێنێتەدی. زەمانێکی درێژ، تا ئەو کاتەی خوا ویستی چاوەروانیان کرد. ئەوسا بەحەیر منداڵەکانی عامیری کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و لەشوێنێك بەناوی (ئێرەم کەلبە) هێرشی کردە سەر منداڵەکانی عەنبەر کوڕی عەمرۆ کوڕی تەمیم. ئەمانە لەخەڵکەکەی خۆیان دوا کەوتبوون. ئەو چوارپێ و ئەسیری گرت و خۆراگری زۆری لەبەردەمدا نەکرا. دواتر فریاد خواز رۆشتە لای منداڵەکانی عەنبەر کوڕی عەمرۆ کوڕی تەمیم و منداڵەکانی مالیك کوڕی حەنزەلە کوڕی مالیك کوڕی زەید مەنات کوڕی تەمیم کوڕی یەربوع کوڕی حەنزەلە و داوای هاوکاری لەوان کرد. ئەوان سوار بوون و بەشوێن تالاَنچیەکان گەڕان. منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی تەمیم بۆ پێشەوە غاریاندا. کاتێت بەحەیر گەشتە شوێنێك بەناوی مەروت، وتی: ئەی منداڵەکانی عامیر، بڕوانن ئایا شتێك دەبینن. وتیان: سوارانێك دەبینین ڕمەکانی خۆیان بەپانی لەسەر شانی ئەسپەکانیان خەواندووە. وتی: ئەمانە منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی تەمیمن و بەهایان نییە. منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی تەمیم هاتن و ماوەیەك شەڕیان کرد و دواتر لەگۆڕپانی شەڕ رۆشتنەدەر. بەحەیر بەردەوام بۆ پێشەوە دەڕۆشت. دواتر وتی: ئەی منداڵەکانی عامیر بڕوانن ئایا شتێك دەبینن. وتیان: سوارانێك دەبینین ڕمەکانیان خۆیان راست لەدەستا گرتووە. وتی: ئەمانە منداڵەکانی مالیك کوڕی حەنزەلەن و بەهایان نییە. منداڵەکانی مالیك کوڕی حەنزەلە گەشتن و

ماوەیەك شەڕیان كرد و دواتر لەگۆڕەپانی شەڕ رۆشتنەدەر. بەحەیر دەڕۆشتە پێش و لەم كاتەدا پرسی: ئەی منالەكانی عامیر ئایا شتێك دەبینن؟ ویتان: سوارانێكی بێ رِم دەبینین كەدەڵێی منالن سوار ئەسپ بوون. وتی: ئەمانە منالەكانی یەربوعن كەرمەكانی خۆیان بەدرێژایی گوێچكەی ئەسپەكانیان بەستۆتەوە. لە مەرگی لەناكاو بترسن و خۆراگری بكەن هەرچەندە گومان ناكەم رزگارتان بێت.

یەكەم كەس كە لەمنالەكانی یەربوع گەشت، بەواقیعە ناودەبرا كەهەمان نەعیم كوڕی عیتابە. لەبەر ئەمە پێان دەوت واقیعە (پێشهاتی مەترسیدار) كە شەڕكەرێكی تێكۆشەر و خوێنرێژ بوو. ئەو هێرشی كردە سەر مەسلەمی قوشەیری و ئەسیری كرد. قوشەیرییەكان هێرشیان كردە سەر دەوكەس كوڕی واقید كوڕی حوت و ئەویان كوشت. هەروەها نەعیم كوڕی عیتاب هێرشی كردە سەر موسەفای قوشەیری و كوشتی. كێدام كوڕی بەجیلەی مازنی هێرشی كردە سەر بەحەیر و پەلاماریدا. قەعنەب جگە لەبەحەیر كەسی نەدەویست. ئەو سەیری شەڕی بەحەیر و كێدامی كرد. بەرەو لای ئەوان غاریدا. كێدام وتی: ئەی قەعنەب، ئەمە ئەسیری منە. قەعنەب وتی: ئەی مازن سەرت لابە تا شمشێرەكەم جیایی نەكاتەوە. كێدام دەستی لەبەحەیر هەلگرت و قەعنەب هێرشی كردە سەری و كوشتی. هەروەها قەعنەب هێرشی كردە سەر سەهبان (كە دایكی ژنێكی مازنی بوو) و ئەسیری كرد. مازنییەكان پێیان وت: ئەی قەعنەب، ئەسیرەكەی ئێمەت كوشت، كوڕی برا (یا كوڕی خوشكەكە)مان لەجیاتی ئەو بۆ وەگەرێنە. ئەو سەهبانی لەجیاتی بەحەیردا بەوان و ئەوان لەم كارە شادمان بوون. منالەكانی یەربوع سامانەكانی منالەكانی عەنبەر و چوارپێ و ئەسیرەكانی ئەوانیان لەمنالەكانی عامیر وەرگرتەوە و گەڕانەوە.

# شەڕی فەیفوئەلریح

ئەم شەڕە لەنێوان عامیر کوڕی سەعسەعە و حارس کوڕی کەعب رویدا. داستانی ئەم شەڕە بەمشێوە بوو منالّەکانی عامیر لەمنالّەکانی حارس کوڕی کەعب داوای خوێنی زۆریان دەکرد. حوسەین کوڕی یەزید کوڕی شەدادی قەنانی حارسی کەپێیان دەوت (**ذوغصە**)، بۆ شەڕ کردن لەگەلّ ئەوان دەستی بەکۆکردنەوەی سوپا کرد. ئەو لەتیرەکانی جوعفی و زوبەید و هۆزەکانی عەشیرە، موراد، سودا، نەهد، خەسعەم، شەهران و ناهس داوای یارمەتی کرد. ئەوان کۆبوونەوە و بۆ شەڕی منالّەکانی عامیر بەڕێکەوتن. عامرییەکان لەشوێنێك بەناوی فەیفوئەلریح لەوەرگایان هەلّبژاردبوو. ژنان و منالّەکان لەگەلّ مزحەج بوون تا رانەکەن. منالّەکانی عامیر کۆبوونەوە و عامیر کوڕی توفەیل بەوانی وت: با هێرش بکەینە سەر ئەم خەلّکە هیوادرام سامانەکانیان تالاّن و ژنەکەیانیان ئەسیر بکەین. رێگە مەدەن ئەوان هێرش بکەنە سەر ئێوە. گوێیان لەوتەکانی گرت و هێرشیان کردە سەریان. کاتێك گەشتنە نزیك منالّەکانی حارس و مزحەج، دیدەوانەکانیان ئاگاداریان کردنەوە و پیرەکانیان گەڕانەوە و ئەمان ئاگادار بوونەوە. دوو لەشکر بۆ ماوەی سێ رۆژلە بەرەبەیانەوە تا ئێوارێ لەشوێنێك بەناوی فەیفو ئەلریح جەنگان. سومەیل کوڕی ئەعوەری کەلابی و عەمرۆ کوڕی سوبەیحی ئەهدی چاویان بەیەك کەوت. عەمرۆ بەرم لێیدا و سومەیل بەپشتا کەوت و دەستی کردە ملی ئەسپەکەی خۆی. پیاوێك لەخەسعەم ئەوی بینی و کوشتی و ئەسپ و جل و بەرگەکانی فڕاند.

لەم رۆژەدا منالّەکانی نومەیر لەپالّ منالّەکانی عامیر کوڕی توفەیل بوون و شەڕیان کرد. بەو رۆژە دەلّێن (**حریجە الطعان**) (دارستانی ڕمەکان)، چوونکە هەردولای شەڕ بەڕمەکانی خۆیان هاتن و خۆیان نیشاندا. (حریجە) بەمانای چڕی دارەکان دێت.

هۆکاری کۆبوونەوەکەیان ئەوەبوو: منالّەکانی عامیر هێرشیان کردە سەر شوێنێك

بەناوی عورقوب. عامر کوڕی توفەیل سەیری دواوەی کرد و بینی مناڵەکانی نومەیر دەستیان لەشەڕ کردن هەڵگرتووە. گەڕایەوە و دەستی بەهاوار کردن کرد: ئای دوژمنەکان! ئەی نومەیرییەکان! دوژمنان گەشتن! لەمەڕۆ بەدواوە من نومەیرم نابێت! ئەسپەکەی بەغاردان لەناو ئەو خەڵکەدا دەسوڕایەوە و ورەی بەرز دەکردنەوە. منالەکانی عامر گەڕانەوە. لەم کاتەدا عامر کوڕی توفەیل لەچاڵی ژێرچەنە تا ناوکی بیست برینی بەرکەوتبوو. ئەو لەناو خەڵکدا دەسوڕایەوە و لەحاڵی دەپرسین و بەیەکیەکیانی دەوت: پیاو، نەمدیوە کارێکت کردبێت، ئەگەر کەسێك شتێکی کردووە، شمشێر یا ڕمەکەی خۆی نیشانی من بدات. ئەوەی بۆ پێشەوە نەڕۆشتبوو، بەم پێداگرتنە بۆ پێشەوە دەڕۆشت و شەڕی دەکرد. هەر کەس بەباشی شەڕی کردبوو، دەهاتە لای و شمشێر یا ڕمەکەی نیشان دەدا.

لەم کاتەدا پیاوێك لەحارسییەکان کەناوی (موسهێر) بوو، هاتە لای عامیر کوڕی توفەیل و وتی: ئەی باوکی عەلی، بڕوانە چیم لەدوژمن کردووە! سەیری ڕمەکەم بکە! کاتێك عامر ڕوی تێکرد، موسهێر بەڕم لێدا و ناوچاوی تەقاند و چاوی کوێر کرد. ئەو ڕمەکەی خۆی دانا و گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی. لەبەر ئەمە ئەو کارەی لەگەڵ عامیر کرد چوونکە بینی عامر بەزۆر و پێداگرتن خەڵك بۆ شەڕ دەنێرێت. بەم شێوە بوو کەوتی: ئەو پیاوە لەناوبەری خەڵکەکەی منە. عامر کوڕی توفەیل لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| لعمری و ما عمری علی بهین | لقد شان حر الوجه طعنة مسهر |
| فبئس الفتی ان کنت اعور عاقرا | جبانا و ما اغنی لدی کل محضر |

واتاکەی: سوێند بە گیانم_ و گیانم بەهای بۆم نەبێت_ کەروخساری جوان، بەهۆی لێدانەکەی موسهێر قێزەون و ناشیرینی بوو. خراپە گەنجێکی وەك من ئەگەر یەك چاو و نەزۆك و پەست بژیم و لە شەڕەکان هیچ کارێك نەتوانم بکەم.

لەم ڕۆژەدا منالەکانی عامیر، سەروەری مورادییەکانیان بەبریندارى ئەسیر کرد.

کاتێك برینەکانی چاك بوونەوە، ئازادیان کرد. لەو کەسانەی لەم ڕۆژەدا بوێرانە شەڕیان کرد، ئەربێدی کوڕی قەیس کوڕی حوڕ کوڕی خالید کوڕی جەعفەر و عوبەید کوڕی شورەیح کوڕی ئەحوەس کوڕی جەعفەر بوون. لوبەید کوڕی ڕەبیعە یا عامر کوڕی توفەیل سەبارەت بەم شەڕە وتی:

| | |
|---|---|
| اتونا بشهر ان العريضة كلها | و اكلبها فی مثل بكر بن وائل |
| فبتنا و من ينزل بنامثل ضيفنا | يبت عن قری اضيافه غير غافل |
| اعاذل لو كان البداد لقوبلوا | و لكن اتانا كل جن و خابل |
| و خثعم حی يعدلون بمذحج | فهل نحن الامثل احدی القبائل |

واتاکەی: لەگەڵ سوپا فراوانەکەی شەهران و کەلبەکانی ئەوان کەهاوشێوەی بەکر کوڕی وایل بوون، هێرشیان کردە سەر ئێمە، شەومان کردە ڕۆژ و هەر کەس وەك میوان بێتە لای ئێمە، لەمیوانداری میوانەکانانی بێ ئاگا نابێت. ئەی سەرکۆنەکەر، ئەگەر هاوتاکانیی خۆمان هێرشیان دەکردە سەر ئێمە، لەبەرابەر ئەوان خۆراگریمان دەکرد بەڵام سوپایەك هاوشێوەی پەری و دێوەکان هێرشیان کردە سەرمان، خەسعەم هۆزێکە دەتوانێت لەگەڵ مزحەج بەرابەری بکات، ئایا ئێمە لەهۆزێك زیاترین؟

کوشتار لەنێوان هەردولای شەڕ زیادی کرد. ئەوسا لەیەك جیابوونەوە و لەم شەڕەدا دوور لەشێوەی عەرەبەکان، سەرقاڵ بوون بەتاڵانی ئەوانی لەکوشتنی یەکتر دور نەخستەوە. خۆراگری و شەڕکەری و گەورەیی لەم شەڕەدا بۆ منداڵەکانی عامر مایەوە.

## شەڕی یەحامیم (شەڕی قارات حوق)

ئەم شەڕە تاییەکان لەناو خۆیاندا دروستیان کرد.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو حارس کوڕی جەبەلەی غەسانی لەنێوان خەڵکی هۆزی تەی ئاشتی سەقامگیر کردبوو و کاتێك مرد، شەڕی ناوخۆیی لەناو ئەمان پەرەی سەند. غەوس و جەدیلە لەشوێنێك بەناوی (غەرسان) چاویان بەیەك کەوت. فەرماندەی مناڵەکانی جەدیلە ئەسبەع کوڕی عەمرۆ کوڕی لام مامی ئەوس کوڕی خالید کوڕی حارسە کوڕی لام کوژرا و پیاوێك لەمناڵەکانی سنبس کەپێیان دەوت مەسعەب هەر دوو گوێچکەی بڕی و پێلاوەکانی خۆی پێ پینە کرد. باوکی سروەی سنبسی لەمبارەوە وتی:

**نخصف بالاذان منكم نعالنا          و نشرب كرها منكم في الجماجم**

واتاکەی: بە گوێچکەی ئێوە پێلاوەکانی خۆمان دەدورینەوە و لەڕوی دوژمنایەتی لەگەڵ ئێوە، لەکاسەی سەرتان دەخۆینەوە.

ئەم دوو هۆزە لەمبارەوە شێعری زۆریان هۆنییەوە و بۆ یەکیان نارد. ئەوەی غەوس کردی، لای ئەوس کوڕی خالید کوڕی لام ناخۆش و گران کەوتەوە و مەبەستی ئەوەی کرد خۆی بڕواتە گۆڕەپانی شەڕ و ئاشی مەرگ لەسەر دوژمن بسوڕێنێت. لەشەڕەکانی پێشو نە ئەو ئامادە دەبوو نەگەورە و سەروەرانی تەی وەك حاتەم کوڕی عەبدوللە و زەید ئەلخەیل و هاوشێوەکانیان. کاتێك ئەوس ئامادەی شەڕ و دەستی بە کۆکردنەوە و ڕازاندنەوە و تەیار کردنی مناڵەکانی جەدیلە کرد، باوکی جابر وتی:

**اقيموا علينا القصد يا آل طي          و الافان العلم عند التحاسب**

فمن مثلنا يوما اذا الحرب شمرت ومن مثلنا يوما اذا لم نحاسب
فان تقطعيني او تريدي مساؤتي فقد قطع الخوف المخوف ركائبي

واتاكەی: ئەی بنەماڵەی تەی، دوبارە مەبەستی ئێمە بکەن و گەرنە دوای ئەوەی لەدوولا دەست بەژماردن بکەین، لاواز لەبوێر جیا دەبێتەوە. کاتێك ئاگری شەڕ دایسێت، چ کەسێك وەك ئێمە بێت، چ کەسێك لەکام ڕۆژ وەك ئێمە بێت کەترسمان نەبێت؟ ئەی دولبەر، ئەگەر دەتەوێت لەمن ببڕیت یا خراپ لەگەڵم هەڵس وکەوت بکەیت، ترس و زراوچون، ورەم دەبات بەشێوەیەك ناتوانم ساز وبەرگ ئامادە بکەم و هێرش بکەمە سەر دوژمن.

غەوسیان ئاگادار بوونەوە لەوەی ئەوسییەکان بۆ شەڕ کۆدەبنەوە. ئاگرەکەی لەشوێنێك هەڵگیرسا کەپێیان دەوت (مەناع) و لەسەر لوتکەی کێوی (ئەجا) بوو. ئەمە یەکەم ڕۆژ بوو ئاوا ئاگرێك لەوێ هەڵدەگیرسا. هۆزەکانی عەرەب یەك یەك هاتن و هەر هۆزێك لەگەڵ سەروەرەکەی خۆی. لەوان زەید ئەلخەیل و حاتەم. مناڵەکانی جەدیلە بەفەرماندەیی ئەوس کوڕی حارسە کوڕی لام گەشتن. ئەوسیەکان سوێندیان خواردبوو لەشەڕی تەی نەگەڕێنەوە مەگەر بگەنە سەر دو کێوەکەی ئەوان (ئەجا و سەلمی) و لەوێ نیشتەجێ بن و کەسانی ئەوێ باجیان پێبدەن. ئەم دووانە، لەژێر ئاڵاکەی خۆیان لە(قارات حوف) چاویان بەیەك کەوت و سوپایەکی گەورەیان کردە سەر یەك و شەڕیان کرد. لەم شەڕەدا ئاشی مەرگ بەسەر مناڵەکانی کوڕی جەندەب سوڕا و لەناوچون. عودەی کوڕی حاتەم دەڵێت: ڕۆژی یەحامیم لەشوێنێك وەستابووم و سەیرم دەکرد کەخەڵك یەکتر کوشتار دەکەن. لەناکاو زەیدئەلخەیلم بینی لەگەڵ دوو کوڕەکەی موکەنەف و حورەیس گەشتۆتە کەلێنێکی دەرنەچوو و پێیان دەڵێت: مناڵەکانم، بەزەییتان بەخەڵکەکەی خۆتان بێتەوە و ئەوان بەزیندوویی بهێڵنەوە چوونکە ئەمرۆ ڕۆژی لەناوچوونە و ئەگەر ئەمانە مامی ئێوەن، ئەوان خاڵۆی ئێوەن. پێم وت: دەڵێی شەڕت لەگەڵ خاڵەکانی خۆت پێ خۆش نییە! دەڵێت: چاوەکانی لەتوڕەییدا سوربوویەوە و بەتوڕەییەوە سەیری کردم تا چاوم هەڵگرت. سەیری زینەکەی ژێریم کرد و دەترسام پەلامارم بدات. سوار

ئەسپەکەم بووم و لێی دورکەوتمەوە. ئەو چاوی لەمن هەلگرت و سەرقالی گفتوگۆ لەگەڵ کوڕەکانی بوو. ئەوان وەك دوو هەلۆ هێرشیان کرد. قەیس کوڕی عازب هێرشی کردەسەر بووحەیر کوڕی زەیدئەلخەیل کوڕی حارسە کوڕی لام و گورزێکی لەسەریدا کەبووحەیر لەزیانەکەی خۆی خستە سەر ملی ئەسپەکە و رایکرد. منالەکانی جەدیلە شکستیان خوارد و بەسەختی کوشتار کران. زەیدئەلخەیل لەمبارەوە وتی:

تجئ بنلا لام جیاد کانها — عصائب طیر یوم طل و حاصب
فان تنج منها لایزل بك شامة — اناء حیا بین الشجا و الترائب
و فر ابن لام ۽ اثقاة بظهره — یردعه بالرمح قیس بن عازب
وجاءت بنو معن کان سیوفهم — مصابیح من سقف فلیس بایب
و مافر حتی اسلم ابن حمارس — لوقعة مصقول من البیض قاضب

واتاکەی:ئەسپە تیژپێکان هێرشیان کردە سەر منالەکانی لام کە لەدەستەی بالندەکان لەرۆژێکی باراناوی و پڕ تەرزە دەچوون. ئەگەر لەنێمە دوورکەویتەوە، بەردەوام نیشانەیەك لەسەر تۆدەبێت و ناوێکی قورگ گر کە لەنێوان سینە تا قورگت دەگوشێت. کوڕی لام رایکرد و پشتی کردە شمشێر وەشێن و قەیس کوڕی عازب رم بەدەست دوای کەوت. منالەکانی مەعن هاوشێوەی ئەو چرایانەی لەسەقفی مالەکانەوە هەلواسرابن، لەرێگەوە گەشتن. هەلنەهات مەگەر دوای ئەوە کوڕی حەمارس جەستەی سپاردە شمشێرێکی درەخشان و برمڕ.

دوای شەڕی یەحامیم کەسی زۆر لەجەدیلە زیندو نەمایەوە. پاشماوەکانی ئەوان رۆشتنە سەرزەمینی کەلب و بوونە هاوپەیمانی ئەوان و لەوێ مانەوە.

## شەڕی زی تولوح

(سەمەد) و (ئود)یش ئەمە دەڵێن. ئەم شەڕە لەنێوان بەکرییەکان و تەمیمییەکان رویدا. داستانی ئەم شەڕە بەم شێوەیە: عەمیرە کوڕی تارق کوڕی ئەرسەمی یەربوعی تەمیمی لەگەڵ مورمییە کچی جابر عێجلی خوشکی ئەبجەر پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و رۆشتە لای مناڵەکانی عێجل تا یەکەم شەوی زاوایەتی لەباوەشی ژنەکەی بەسەر ببات. ئەو ژنێکیتری ناسراو بەناوی (کچی نەتف) لەمناڵەکانی تەمیمی هێنابوو. ئەبجەر هات تا چاوی بەخوشکەکەی خۆی بکەوێت. هاوسەرەکەیشی لەوێ بوو. ئەبجەر بەخوشکەکەی خۆی وت: هیوادارم کچی نەتف گرفتار بکەم و بیهێنمە لای تۆ تا هاوسەرەکەی تری مێردەکەت کەنیزی تۆ بێت. عەمیرە وتی: وای دەبینم دەست لەمن هەڵناگریت تا من لەبنەماڵەکەم جیامبکەیتەوە. ئەبجەر پەشیمان بوویەوە و بەعەمیرەی وت: من مەبەستی شەڕم لەگەڵ خەڵکەکەی تۆنییە بەڵام دەمەوێت لەم بەشەی تەمیم ئەسیرێك بگرم. ئەبجر وحەوفەزان کوڕی شەریکی شەیبانی دەستیان بە کۆکردنەوەی سوپا کرد. حەوفزان فەرماندەی شەیبانییەکان و ئەبەجەر فەرماندەی لەهازیم بوو. ئەم دوانە کەسێکیان بۆ عەمیر دانا تا چاودێری بکات و رێگە نەدات خەڵکەکەی ئاگادار بکاتەوە. سوپاییەکان بەرێکەوتن. عەمیرە چاودێرەکەی خۆی هەڵخەڵەتاند و رایکرد وبەپەلە بەرێکەوت تا گەشتە مناڵەکانی یەربوع و ئاگاداری کردنەوە: سوپایەك لەبەکر کوڕی وایل دێتە شەڕی ئێوە. ئەوان مناڵەکانی سەعلەبەیان ئاگادار کردەوە کەتیرەیەك لەوان بوون. چەندین پێشەنگیان رەوانە کرد و سێ رۆژ چاوەڕێ بوون. بەکرییەکان گەشتن و یەربوعییەکان سوار بوون. دوو لەشکر لەزی تولوح روبەروی یەك بوونەوە. عەمیرە سوار بوو، چاوی بە ئەبجەر کەوت و خۆی پێ ناساند. دوو سوپا دەستیان بەشەڕ کرد و یەربوعییەکان سەرکەوتن. بەکرییەکان شکستیان خوارد و حوفزان و کوڕەکەی شەریك و کوڕی عەنمەی شاعیر ئەسیر کران. ئەم پیاوە لەدەستی مناڵەکانی شەیبان مایەوە تا موتەمەم کوڕی ئەویرە بەهای ئازادی ئەویدا و ئازادی

کرد. بەشی زۆری سوپایی بەکرییەکان ئەسیر کران. کوڕی عەنمە بۆ سپاس کردنی موتەمەم ئەم شێعرەی وت:

| | |
|---|---|
| جزى اللهّ رب الناس عنى منمما | بخير الجزاء ما اعف و اجودا |
| اجيرت به ابناؤنا و دماؤنا | و شارك فى اطلاقنا و تفردا |
| ابا نشهل انى لكم غير كافر | ولا جاعل من دونك المال سرمدا |

واتاکەی: خواوەند کەپەروەردگاری خەڵکە، موتەمەم باشتر لەمن پاداشت بدات. چەند داوێن پاك و پیاوێکی بەخشەرە. کوڕەکانمان پەنایان بۆبرد و لەخوێن ڕژانی زیاتری ئێمە ڕێگری کرد، لەئازاد کردنی ئێمە بووە شەریك و بەتەنیایی بەم کارە هەستا. ئەی باوکی نەشهەل، ئێمە ناسپاسی ئێوە ناکەین و تا هەمیشە لەکەسێکی ئێوە سامان وەرناگرین.

## شەڕی نەقرون

باوکی عوبەیدە دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عەمرۆ کوڕی عەدوسی تەمیمی لەگەڵ عەبەسییەکان شەڕی کرد و وشترەکانی ئەوانی گرت و چەندین کەسی لەوان ئەسیر کرد و گەڕایەوە. کاتێك گەشتە خوارەوەی تەپۆڵکەی نەقرون، لەگەڵ یەکێك لەکچە ئەسیرەکان خەوت و پەردەی کچێنی هەلگرت. ئەوانەی شوێنی کەوتبوون، پێی گەشتن و شەڕێکی قورس رویدا و ئونس ئەلفوارس کوڕی زیادی عەبەسی، عەمرۆ و کوڕەکەی حەنزەلەی کوشت و شەڕکەران، ئەسیرەکان و سامانە تالآن کراوەکانیان وەرگرتەوە. جەریر هەواڵی ئەم مەرگەی بەمناڵەکانی دارم گەیاند و وتی:

اتنسون عمرا يوم برقة اقرن      و حنظله المقتول اذهو يافعا

واتاکەی: ئایا ئەو شەڕەی لەسەرزەمینی سەخت و نالەباری نەقرون رویدا، لەبیر دەکەن؟ ئایا حەنزەله لەبیر دەکەن کە لەمێردمنداڵیدا کوژرا؟

عەمرۆ پیاوێکی پیس وپێست سوتاو بوو. ئەو و هاوەڵەکانی لەکاتی گەڕانەوە، گەردنەی رێگایان بەهەڵە بڕی ولەرێگا دوورکەوتنەوە و گیرۆدەی دژوارییەکان بوون. عەنتەرە لەمبارەوە وتویەتی:

كان السرايا يوم نيق و صارة      عصائب طير ينتجين لمشرب
شفى النفس منى اودنا لشفائها      تهورهم من حالق متصوب
و قد كنت اخشى ان اموت و لم تقم      مراتب عمرو وسط نوح مسلب

واتاکەی: وەك بڵێی شەڕکەران لەوڕۆژەدا لوتکە و دژواری ( ڕۆشتنە سەر و دابەزین) ئەو دەستە لەباڵندەکان بوون کە لەسەر شوێنی ئاو خواردنەوە دابەزین.

دڵم حەسایەوە یا ئەوەندەی نەما بوو بحەسێتەوە چوونکە بینیم خراپەکاران لەبەرزایی و هەڵدێر خزان و پەرپەرِ بوون. ترسم لەوە بوو بمرم و نەیبینم ئایینی پرسە گێڕانی عەمرۆ لەناو ژنە شین کەرەکاندا .

دایکی سەماعە کوڕی عەمرۆ کوڕی عەمرۆ لەعەبەسییەکان بوو. خاڵۆی ڕۆشتە سەردانی و ئەوی لەبەرچاوی کوڕەکەیدا کوشت. مسکینی دارمی لەمبارەوە وتی:

و قاتل خاله بابیه منا ‌ ‌ ‌ ‌ سماعة لم يبع نسبا بخال

واتاکەی: سەماعە کەخاڵۆی لەبەرچاوی باوکیا کوشت و نەژادی بەخوێنی کوژراوی خۆی نەفرۆشت، لەئێمەیە.

## شەڕی سولان

باوکی عوبەیدە دەڵێت: مناڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە خەڵکانێکی بەهەست بوون و ئەم (خەڵکە بەهەستە) قورەیشییەکان و خزمەکانی ئەوان بوون. ئەوان بە توندی پارێزگارییان لەدینەکەی خۆیان دەکرد. عامرییەکانیش خەڵکانێکی نافەرمان بوون و سەریان بۆ شاکان دانەدەنەواند. بەرێکەوت، خوسرەو پەرویز، پاشایەتی بەنەعمان کوڕی مونزەر بەخشی. ئەو ساڵانە کاروانێکی لەدەرمانە بۆنخۆشکەرەکان و کاڵا گرانبایییەکان بۆ بازرگانی و کڕین و فرۆش بۆ بازاری عەکاز دەنارد. جارێکیان مناڵەکانی عامیر هێرشیان کردە سەر کاروانەکەی ئەو بەشێك لەکاڵا بازرگانییەکانی ئەویان تاڵان کرد. نەعمان لەم کارە توڕەبوو و کەسێکی بۆ لای زڕبرای دایکی خۆی وەبرە کوڕی رۆمانس نارد و هاوڕێ لەگەڵ ئەو (**وضايع**) و (صنايع)ی خۆی نارد. **وضايع** هاوشێوەی پیرەکانی هۆز بوون و صنايع ئەو دەست پەروەردانە بوون کەپاشا ئەوانی بۆ شەڕ پەروەردە دەکرد. ئەو کەسی بۆ لای مناڵەکانی زەببە کوڕی ئود و کەسانیتر لەرەباب و تەمیم نارد و داوای هاوکاری لێکردن. ئەوان رازی بوون و لەدەوری کۆبوونەوە. زەرار کوڕی عەمرۆ و زەببی هاوڕێ لەگەڵ نۆ کەس لەکوڕەکانی کە هەموویان سوارکاری شارەزا و شەڕ دیتوبوون، لەگەڵ حەبیش کوڕی دولف کەئەویش سوارکارێکی بوێر بوو، ڕۆشتنە لای نەعمان. سوپایەکی گەورە کۆبوویەوە. نەعمان لەگەڵ ئەوان کاروانێکی ئامادە کرد و فەرمانی پێدا لەگەڵی بڕۆن. بەوانی وت: کاتێك بازاری عەکازتان تەواو کرد و مانگە حەرامەکانتان تێپەڕ و خەڵکان گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان، مەبەستی مناڵەکانی عامیر بکەن کە لەنزیك ئێوە سولانن. ئەوان هاتنەدەر و فەرمانەکەیان بەنهێنی هێشتەوە. وتیان: لەبەر ئەوە بەم شێوە هاتین تا کەس زیان بەکاروانی پاشا نەگەیێنێت.

کاتێك خەڵك لەبازاری عەکاز تەواو بوون، قورەیشییەکان لەمەبەستی ئەوان ئاگادار بوونەوە. عەبدوللە کوڕی جودعان کەسێکی بۆ لای مناڵەکانی عامیر نارد و

ئەوانی ئاگادار کردەوە. کەسەکە هەواڵەکەی گەیاند. ئەوان وشیار بوونەوە و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد و دیدەوانیان دانا. عامرییەکان گەڕانەوە و فەرماندەکەیان عامر کوڕی مالیکی ڕمباز بوو. لەسولان چاویان بەیەك کەوت و شەڕێکی قورس ڕوویدا. لەگەرماوگەرمی شەڕەکە، یەزید کوڕی عەمرۆ کوڕی خومیلێدی سەعق لەوەبرە کوڕی ڕۆمانس برای نەعمانی ڕوانی و لەشکۆ و زێر و زیو و جل و بەرگە گرانبایبەکانی ئەو هاتە جۆش. هێرشی کردە سەری و ئەسیری کرد. لەکاتی ئەسیریدا، سوپاکەی مەبەستی پاشەکشێی کرد بەڵام زەرار کوڕی عەمرۆ زەبی ڕێگەی لەوان گرت و فەرماندەیی ئەوانی گرتە دەست و هاوڕێ لەگەڵ کوڕەکانی خۆی شەڕێکی بوێرانەی کرد. کاتێك باوکی بەرا عامیر کوڕی مالیك سەیری کرد کەهاوڕێ لەگەڵ کوڕەکانی چی لەعامرییەکان دەکات، هێرشی کردە سەر. باوکی بەرا بازوی بەهێز و ئەستور بوو. کاتێك هێرشی کردە سەر زەرار، شەڕ لەنێوان ئەم دوانەدا دەستی پێکرد. زەرار کەوتە سەر زەوی و کوڕەکانی جەنگان و ڕزگاریان کرد. ئەو سواربوویەوە. ئەوپیاوێکی پیر بوو. کاتێك سوار بوو، وتی: (هەر کەس کوڕەکانی شادی بکەن، لەخۆی ناشاد دەبێت) (یانی کاتێك کوڕەکان گەورە دەبن، باوك پیر و بێ کەڵك دەبێت و لەژیان بێزار). ئەم وتەیە بوو بەپەند. مەبەستەکەی ئەوەبوو کاتێك کوڕەکانی دەبنە پیاو و بەپیاوەتی دەگەن و دەبنە هۆکاری شادمانی باوك، ئەو پیر و سست و دەبێت و لەم چارەنوسە بێزار.

باوکی بەرا بەردەوام بەدوای زەراردا دەگەڕا بۆ ئەوەی ئەسیری بکات و بۆ ئازاد کردنی بەهایەکی گەورە وەبگرێت. کوڕەکانی پارێزگاریان لێدەکرد. کاتێك باوکی بەرا ئەمەی بینی، بەزەراری وت: یا دەمریت یادەمرم و لەڕێگەی ئەسیر کردنی تۆ دەکوژرێم. کەواتە پیاوێك نیشانی من بدە کە بەهای ئازادییەکەی زۆر بێت. زەرار بەدەست، حەبیش کوڕی دولفی نیشاندا. ئەو سەروەرێکی بەشکۆبوو. باوکی بەرا هێرشی کردە سەر و ئەسیری کرد. حەبیش ڕەش و ناشیرین و لاغر بوو. کاتێك باوکی بەرا ئەمەی بینی، وتی: پەنا بەخوا، کەسانی تر باری خۆیان بەست و من گیرۆدەی ئەم شانسە خراپە بووم! کاتێك حەبیش ئەمەی بیست ترسا بیکوژێت. پێی وت: ئەی پیاو، ئەگەر شێر(یانی وشتر) دەویست، بەدەستت هێنا. ئەو خۆی بە

چوارسەد وشتر كرییەوە و سوپاكەی نەعمان شكستی خوارد. هەڵاتووان بۆ لای نەعمان گەڕانەوە و لەوەی رویدابوو، ئاگاداریان كردەوە كەبراكەی ئەسیر كرا و زەرار فەرماندەیی گرتەدەست و ئەو لەگەڵ باوكی بەرا چییان وت و چییان كرد. وەبرە كوڕی رۆمانس خۆی بەهەزار وشتر و ئەسپ لەیەزید كوڕی سەعق كرییەوە، یەزید دەوڵەمەند بوو. پێشتر سواڵكەرێكی بەدبەخت بوو. لوبەید سەبارەت بەشەڕی خەڵكەكەی خۆی وتی:

| | |
|---|---|
| انی امرؤ منعت ارومة عامر | ضیمی و قد حنقت علی خصوم |

لەم قەسیدەدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| و غداة قاع القریتین اتاهم | رهوا یلوح خلالها التسویم |
| بكتائب رجح تعود كبشها | نطح الكباش كانهن نجوم |

واتاكەی: من پیاوێكك كەنەژادی بڵندی عامری منی لەستەم كردن دورخستەوە و دوژمن، دڵی لەرقی من پڕ كرد. لەدەشتی رێكی دو لادێ لەكاتی بەرەبەیان بەسوپایەكی گەورە هێرشیان كردە سەریان بەشێوەیەك ئەسپە تیژپێكان لەناویاندا ئاشكرابوون. لەگەڵ ئەو شەڕكەرە زۆرانەداهات كەهاوشێوەی دەریا شەپۆلیان دەدا و فەرماندەكەیان عادەتی بوو شاخ لەشاخی دوژمن بكوتێت، ژمارەی ئەم شەڕەكەرانە بەئەندازەی ئەستێرەكان بوو.

مەبەستی لەدەشتی نێوان دولادێ هەمان سولانە كە شەڕەكە لەوێ رویدا.

## شەڕی زی عەلەق

ئەمە ئەو شەڕەیە منالەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە لەگەڵ منالەکانی ئەسەد لەشوێنێك بەناوی زی عەلەق هەڵیانگیرساند. لەشەڕەکەدا، باوکی لەبیدی شاعیر یانی رەبیعە کوڕی مالیك کوڕی جەعفەر کوڕی کەلابی عامری کوژرا و عامرییەکان شکستیان خوارد. خالید کوڕی نەزڵەی ئەسەدی و کوڕەکەی حەبیب هەروەها حارس کوڕی خالید کوڕی موزەلەڵ شوێنیان کەوتن و سوربوون لەسەر کارەکەیان. ئەمان لەناکاو بینیان باوکی بەرا عامیر کوڕی مالیك، لەپشتەوە لەگەڵ چەند لەهاورێکانی خۆی هێرشی کردونەتە سەر. ئەو بەخالیدی وت: ئەی باوکی مەعقەل، ئەگەر بتەوێت ئەتوانیت لەگەڵ ئێمەدا رێکەویت بەشێوەیەك هەردووك بریندارەکانی خۆمان هەلگرین و کوژراوەکان بەخاك بسپێرین. خالید وتی: رازیم. ئەوان رێککەوتن. باوکی بەرا وتی: رەبیعە چی بەسەر هات؟ خالید وتی: بەکوژراوی بەجێم هێشت. باوکی بەرا وتی: کێ ئەوی کوشت؟ خالید وتی: من شمشێرەم لێدا و سامت کوڕی ئەفقەم سەری بڕی. کاتێك باوکی بەرا هەواڵی کوژرانی رەبیعەی بیست، لەگەڵ هاوەڵەکانی هێرشی کردە سەر خالید. خالید و دوو هاورێکەی لەم کارە دووریان خستنەوە و کەرەستەی شەڕی حەبیبی خالدییان گرت و ئەسەدییەکان گەشتن و پەنایان بەهاورێکانی خۆیاندا. جومەیح لەمبارەوە وتی:

سائل معدا عن الفوارس لا ... اوفوا بجيرانهم و لا سلموا
يسعي بهم قرزل و يستمع الـ ... ـناس اليهم و تخفق اللم
ركضا وقد غادروا ربيعة في ... الاثار لما تقارب النسم
في صدره صعده و يخلجه ... بالرمح حران باسلا اضم

واتاکەی: بەمەعدییەکان بڵێ کە نە پەنابەرانی خۆیان پەنادا و نەخۆیان بەسلامەت رزگاریان بوو. ئەسپی (قرزل) ئەوانی بۆ پێشەوە دەبرد و خەڵك گوێیان

دەگرت و سوپاییەکان دەجولآن و دەخرۆشان، هەموویان بەراکردن ڕۆشتن و ڕمبیعەیان بەکوژراوی بەجێهێشت و خوێنی ئەویان لەبیرکرد و باکان هەڵیان کرد. لەسینەیدا ڕمێك بوو کەپیاوێکی بوێر نەترس و تینوی خوێن لەسینەی چەقاند.

(قەرزل) ئەسپی توفەیل باوکی عامر کوڕی توفەیل بوو.

عامر لەقەسیدەیەك لەبیرەوەری باوکیدا دەڵێت:

**ولامن ربیع المقترین رزئته　　　　بذی علق فاقنی حیاءك و اسبری**

واتاکەی: لەبەهاری هەژاران لەزی عەلەق داغدار نەبووم، کەواتە ڕێز لەشەرمی خۆت بگرە و خۆڕاگر بە.

## شەڕی ڕەقەم

باوکی عوبەیدە دەڵێت: منداڵەکانی عامیر کوڕی سەعسەعە هێرشیان کردە سەر غەتەفان و لەم ڕۆژەدا عامر کوڕی توفەیل ئامادە بوو. ئەو هێشتا گەنجێکی تازە پێگەیشتو و پێگەی سەروەری بەدەست نەهێنابوو. ئەوان گەشتنە گوندەی ڕەقەم و لێرە منداڵەکانی مورە کوڕی عەوف کوڕی سەعد هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك لەئەشجەع کوڕی ڕەئیب کوڕی غەتەفان و دەستەیەك لەفەزارە کوڕی زوبیان نیشتەجێ بوون. ئەوان لەمەبەستی عامرییەکان ئاگادار بوونەوە و ترسان. عامرییەکان لەڕەقەم (دۆڵێك لەنزیکی تەزرۆع) هێرشیان کردنە سەر و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. عامر کوڕی توفەیل هاتە پێش و ژنێك لەفەزارەی بینی و لەناو و نەژادی پرسی. ژن وتی: من ئەسما کچی نۆفلی فەزارەییم. دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئەسما کچی حیسن کوڕی حوزیفە بوو. لەهەمان کات کەعامر لەگەڵ ئەو ژنەدا گفتوگۆی دەکرد، لەناکاو خەڵکە تێکشکاوەکەی هاتنە لای و منداڵەکانی مورە بەدوایانەوە بوون. کاتێك عامر ئەمەی بینی، زرێکەی خۆی بۆ ئەسما فرێدا و هەڵات. ماوەیەك دوای ئەوە ئەو ژنە زرێکەی بۆ گەڕاندەوە. منداڵەکانی مورە بەدوای هەڵاتواندا ڕۆشتن و فەرماندەکەیان سنان کوڕی حارسە کوڕی ئەبی حارسە بوو. ئەشجەعیان هەرکەسیان لەمنداڵەکانی عامیر ئەسیر دەکرد، سەریان دەبڕی و ئەمە لەبەرابەر ئەو ستەمە بوو پێشتر عامرییەکان بەرابەر بەمان ئەنجامیان دابوو. ئەم تیرە لەمنداڵەکانی ئەشجەع بەناوی منداڵەکانی مزجەح دەناسران. ئەوان هەفتا عامرییان سەرپڕی. عامر کوڕی توفەیل لەیادی غەتەفان و گفتوگۆی خۆی لەگەڵ ئەو ژنەدا وتویەتی:

قد ساءلت اسماء و هی خفیة — لضحائها اطردت ام لم اطرد

فلا بغینکم القنا و عوارضا — و لا قبلن الخیل لابة ضرغد

ولا برزن بمالك و بمالك — و اخی المرورات الذی لم یسند

واتاکەی: ئەسما کەخۆی داشاردبوو و بەنهێنی قسەی دەکرد، پرسی: ئایا من راونرام یا راونەنرام. بێ گومان بۆ شەڕ لەگەڵ ئێوە ڕمی سینگ قەڵشێن هەڵدەگرم و ڕوداوەکان دەخولقێنم. بێ گومان سوارکاران لەسەرزەمینی (لابة ضرعد) غارپێ دەدەم. بێ گومان بۆ شەڕی مالیك دەڕۆمەدەر و ڕێگە لەو کاروانانە دەگرم کەڕێبەر و کاروانداره‌کەی ئەو نەبێت.

ئەم قەسیدەیە دوور ودرێژە. کاتێك ئەم وتارە بەگوێی غەتەفانییەکان گەشت، دەستەیەك لەوان خراپەیان وت. لەم کاتەدا نابغەی زوبیانی لەناو خەڵکەکەی خۆی نەبوو و لای پاشاکانی غەسان دەژیا. ئەو لەنەعمان کوڕی مونزەر رایدەکرد (لەبەر ئەوەی ژنە جوانەکەی نەعمانی خستبووە تۆڕەوە و چێژی لێوەرگرتبوو). کاتێك پاشای عەرەب نەعمان لەگوناحەکەی خۆش و ئەوەی بەخشی، گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی و لەوانی پرسی بۆچی لەشێعرەکانی خۆیان خراپەی عامر کوڕی توفەیلیان وتووە. ئەمان وتار و قەسەکانی خۆیانیان بۆ گێرایەوە. نابغە وتی: جنێوتان داوە. نابێت یادی کەسێکی وەك عامر بەم قسانە بکرێتەوە. ئەوسا ئەم شێعرانەی وت و سەرکۆنەی عامری کرد کەبۆ چی لەیەکێك لەشێعرەکانی خۆی ئامازەی بەیەکێك لەژنە بەرێز و ئابرودارەکانی هۆزی دوژمن داوە:

| | |
|---|---|
| فان يك عامر قد قال جهلا | فان مطية الجهل الشاب |
| فانك سوف تحلم او تباهى | اذا ما شبت او شاب الغراب |
| فكن كابيك او كابى براء | توافقك الحكومة و الصواب |
| فلا تذهب بحلمك طاميات | من الخيلاء ليس لهن باب |

واتاکەی: ئەگەر عامر لەروی نەزانییەوە قسەیەکی کردووە، ترسێك نییە چوونکە نەزانە ئەو چوارپێیەی گەنجەکان سواری دەبن. تۆ بەزوترین کات دەبیتە فرەزان یا وشیار دەبیتەوە و ئەمە لەکاتێکدایە پیربوویت یا سەروەری و ڕاست کرداری ببێتە هاوئامێزت. کەواتە ڕێگە مەدە پێشهاتە تێپەڕەکان کە لەخۆپەسەندییەوە سەرچاوە دەگرن و بەرێگەیەکی ڕاست ناگەن، ئاوز لە تۆ

بسرنەوە.

تا کۆتایی قەسیدەکە. کاتێك عامر ئەمەی بیست، وتی: پێش لەمە خراپەی منیان نەوتبوو ( ئەوەی وتبوویان، خراپ وتن نەبوو بەڵکو هەڵیت و پڵیت بوو).

## شەڕی ساحوق

باوکی عوبەیدە دەڵێت: مناڵەکانی زوبیان لەشوێنێك بەناوی ساحوق هێرشیان کردە سەر مناڵەکانی عامیر و فەرماندەی زوبانییەکان، سنان کوڕی ئەبی حارسەی موڕی بوو. ئەو ساز و بەرگ و کەرەستەی شەڕ و وشتری پێدابوون. زوبانییەکان لەم شەڕە تالآنی زۆریان بەدەست هێنا و گەڕانەوە.

عامرییەکان شوێنیان کەوتن و ئەوانیان بەدەست هێنا و شەڕێکی قورسیان لەگەڵ کردن. بەلآم عامرییەکان شکستیان خوارد و چەندین پیاویان لێ کوژرا، لەبەر ئەمە رویان کردە بیابان و زۆربەیان لەتینویەتیدا مردن چوونکە هەوا گەرم بوو. کار گەشتە ئەو شوێنەی هەر کات زوبیانییەك عامرییەکی دەبینی، دەیوت: بووەستە، کەل وپەلی شەڕ دابنێ تا لەگیانت خۆشبم. ئەویش ئەم کارەی دەکرد. بۆ عامرییەکان رۆژگارێکی سەخت بوو. عامر کوڕی توفەیل و براکەی حەکەم شکستیان خوارد و هەلآتن. لەم کاتەدا حەکەم سست و ناتەوان بوو و ترسا ئەسیر بکرێت. لەبەر ئەمە تەنافێکی هەڵگرت و رۆشتە سەر دارێك و سەرێکی بەلقێك بەستەوە و سەرەکەی دیکەی کردە ملی و خۆی هەڵواسی و خۆی کوشت. هاوشێوەی ئەم کارە پیاوێکی دیکە لەمناڵەکانی غەنی کردی بەلآم کاتێك خۆی فرێدا پەشیمان بوویەوە و دەستی بۆ ملی دەبرد و هاواری دەکرد. خەڵك بەرەو لای ڕۆشتن و رزگاریان کرد و بۆ گریان و شین کردنەکەی سەرکۆنەیان کرد. عوروە کوڕی وەردی عەبەسی لەمبارەوە وتی:

ونحن صبحنا عامرا فی دیارها — علالة ارماح و ضربا مذکرا
بکل رقاق الشفرتین مهند — ولدن من الخطی قد طر اسمرا
عجبت لهم اذ یخنقون نفوسهم — و مقتلهم تحت الوغی کان اجدرا

واتاکەی: ئێمە بەرەبەیان هێرشمان کردە سەر عامرییەکان و ئەوانمان کردە خۆراکی ڕمە تیژەکان و شمشێر خوێنڕێژەکان. بەشمشێرە هیندیەکان کە هەردوو لێوەکەیان باریك و تیژە و ڕمە دروست کراوەکانی خەت (دروستکراوی گوندی خەتی بەحرەین) گیانی ئەوانمان گرت. سەرمان لەوان سورماوە بۆچی خۆیان دەخنکێنن لەگەڵ ئەوەی مەرگیان لەگۆڕەپانی شەڕ شیاوتر بوو.

## شەڕی ئەعیار و شەڕی نەقیعە

موسلیم کوڕی موشەجەری عایزی زەببی دراوسێی منداڵەکانی عەبەس بوو. ڕۆژێك لەگەڵ عومارە کوڕی زەیاد کەپیرێکی شارەزا و لێهاتوبوو، تاوڵەی کرد. عومارە دە بەچکە وشتری لێ بردەوە. موسلیم داوای لێکرد ئازادی بکات تا بڕواتە لای کەسەکانی خۆی و قەرزەکەی خۆی بنێرێت. عومارە ئەم کارەی نەکرد. ئەو کوڕەکەی خۆی شێرحاف کوڕی موسلیمی لای عومارە وەك بارمتە دانا و گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی و بەچکە وشترەکانی وەرگرت و بردی بۆ عومارە و کوڕەکەی خۆی ئازاد کرد.

کاتێك باوك و کوڕ بەرێکەوتن، کوڕ وتی: ئەی باوکە (**معضال**) کێ بوو؟ باوك وتی: پیاوێك لەئامۆزاکانی تۆ کەڕۆشت و تا ئێستا هیچ نیشانێکی نییە. شێرحاف وتی: من کوژەرەکەی دەناسم. باوك وتی: کێیە؟ شێرحاف وتی: ئەو عومارە کوڕی زیادە چوونکە ڕۆژێك کەشەرابی خواردبوو، بەخەڵکەکەی خۆی وت کە **معضالی** کوشتووە بەڵام کەس بەدوایدا نەگەڕاوە.

ڕۆژگارێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی و شێرحاف گەورە بوو و گەشەی کرد. ئەوسا عومارە دەستەیەکی زۆری کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان هێرشی کردە سەر منداڵەکانی زەببە. تالانکەران وشترەکانی ئەوانیان گرت و فڕاندیان. منداڵەکانی زەببە سوار بوون و خۆیان گەیاندە لەوەڕگاکانی ئەوان. کاتێك شێرحاف سەیری عومارەی کرد، وتی: ئەی عومارە، دەمناسیت؟ عومارە وتی: کێیت؟ وتی: شێرحافم. کوڕە

مامەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە. ئەو رۆژەی بەدەستی تۆ کوژرا، وێنەی نەبوو. شێرحاف هێرشی کردە سەر عومارە و کوشتی. عەبەسییەکان و منالّەکانی زەببە بەقورسی شەڕیان کرد و منالّەکانی زەببە وشترەکانی خۆیان وەرگرتەوە. شێرحاف وتی:

الا ابلغ سراة بنى بغيض بما لاقت سراة بني زياد
و مالاقت جذيمة اذ تحامى و ما لاقى الفوارس من بجاد
تركنا بالنتيعة آل عبس شعاعا يقتلون بكل واد
و ما انا فاتنا الا شريد يوم القفر فى تيه البلاد
فسل عنا عمارة آل عبس و سل و ردا و ما كل بداد
تركتهم بووادى البطن رهنا لسيدان القرارة و الجلاد

واتاکەی: بەگەورەی منالّەکانی بەغیز بلّێ چی بەسەر گەورەی منالّەکانی زیاد هات. جەزیمە لەگۆڕەپانی شەڕ چی بینی و سوارکارانی بجاد چیان بینی. لەناوگرەکەی نەقیعە روبەروی منالّەکانی عەبەس بووینەوە، بلاّو بوونەوە و لەهەر دۆلّێکدا دەکوژران. کەس لەدەست ئێمە رزگاری نەبوو مەگەر ئاوارەیەك کە لەبیابانە وشك و بێ بەرهەمەکان، سەرگەردان بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوە. ئەی عومارە، سەبارەت بەئێمە لەعەبەسییەکان بپرسە، لەوەرد بپرسە هەرچەند هەموویان رکەبەری ئێمە نەبوون. ئەوانمان لەقولاّیی دۆلّ بۆ گورگەکانی ناوگر و دەشتە نارێکەکان بەجێهێشت.

## شەڕی نەبات

باوکی عوبەیدە دەڵێت: عامرییەکان لەماڵەکانیان هاتنەدەر و مەبەستی غەتەفانییەکانیان کرد تا ڕقی کۆن و تۆڵەی خۆیان لەشەڕی ڕەقەم و ساحوق وەربگرنەوە. عەبەسییەکان لەشەڕی ڕەقەم بەشدار بوون نە لەساحوق. ئەوان هاوکاری غەتەفانییەکانیان نەکردبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ عامرییەکان. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو، بەڵکو ئەشجەعییەکان و فەزارییەکان و غەتەفانییەکانیتر، بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدەدەین، لەو شەڕانەدا بەشدار بوون. منداڵەکانی عامر هێرشیان کردە سەر چوارپێکانی منداڵەکانی عەبەس ومنداڵەکانی زوبیان و منداڵەکانی ئەشجەع و ئەوانیان گرت وبەرەو سەرزەمینەکانی خۆیان بەڕێکەوتن. ڕێگەیان هەڵە کرد و کەوتنە سەر ڕێگای دۆڵی نەبات و لەوێ دابەزین، نە ڕێگەییان بۆ پێشەوە برد ونە ئاوەیانی و ڕێگەی چونەدەرەوەیان بەرچاو کەوت. درێژەیان بەڕێگەکەدا. ئەوەندەی نەمابوو دو کێوەکە بدەن لەیەك لەناکاو ژنێك لەمنداڵەکانی عەبەسیان لەسەر لوتکەی کێوەکەی بینی کە لەدارەکان گەڵای بۆ ئەوان لێدەکردەوە. ڕێگای چونەدەرەوەیان لێپرسی. ژن وتی: ئەو سوارانە ڕێگەی چونەدەرەوەن. ژن لەسەر لوتکەی کێو سوارەکانی بینی رویان لەوێ دەکرد. منداڵەکانی عامر سوارەکانیان نەبینیبوو چوونکە لەناو دۆڵەکەدا بوون. ئەوان پیاوێکیان ناردە سەر لوتکەی کێوەکە تا لەدەوروبەر بروانێت. بەوانی وت: خەڵکانێك دەبینم هاوشێوە منداڵەکانن لەسەر ئەسپ و نوکی ڕمەکانیان بەدرێژایی گوێچکەی ئەسپەکانیان داناوە. وتیان: ئەمانە منداڵەکانی فەزارەن. دیدەوان وتی: دوبارە خەڵکانێکی پێست سپی و قژبژ دەبینم دەڵێی جل و بەرگی سوریان لەبەردایە. وتیان: ئەمانە منداڵەکانی ئەشجەعن. دیدەوان وتی: دوبارە خەڵکانێك هاوشێوەی کۆمەڵی لاشخۆرەکان دەبینم کەخۆیان لەسەر زینی ئەسپەکانیان لابردووە و دەڵێی لەسەر ڕانی خۆیان بەڕێگادا دەڕۆن و سەری ڕمەکانیان بەدەستەوە گرتووە و بەدوای خۆیاندا دەیکێشن. وتیان: ئەمانە عەبەسییەکانن، مەرگی کتاوپڕ بۆ ئێوە

داباری! ئەوانیان لەناو دۆڵەکەدا بینی. عامر کوڕی توفەیل یەکەم کەس بوو پڕییە سەر ئەسپەکەی (ورد) یا (مربووق) و هەڵات. ئەسپەکە شەکەت بوو. عامر کوشتی تا فەزارییەکان بۆ جوت گرتن کەڵکی لێنەبەن. خەڵك روبەروی یەك بوونەوە و دەستیان بە کوشتاری یەك کرد و شەڕ لەناو ئەوان درێژەی کێشا. عامرییەکان شکستیان خوارد و کوشتار کران. لەم شەڕەدا لەگەورەکانی عامر ئەمانە کەوتنە سەر زەوی: بەرا کوڕی عامر کوڕی مالیك (ناوی باوکی باوکی بەرا لەو وەرگیراوە) نەهشەل، ئونس و هەزار کوڕی مورە کوڕی ئونس کوڕی خالید کوڕی جەعفەر، عەبدوللە کوڕی توفەیل برای عامر (کەبەدەستی رەبیع کوڕی زیادی عەبەسی کوژرا) و کەسانیر زۆریتر. شکانی منالەکانی عامر قورس و دژوار بوو.

## شەڕی فورات

باوکی عوبەیدە دەڵێت: موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی کوڕی خوشکی عیمران کوڕی مورە هێرشی کردە سەر ماڵەکانی تەغلەب و ئەوان لەقەراغ فورات بوون. ئەم شەڕە بەر لەماوەیەك پێش ئیسلام رویدا. ئەو بەسەر ئەوان سەرکەوت و هەر کام لەشەڕکەرانی ئەوانی گرت، کوشتی و ژمارەیەکی زۆر لەوان کەوتنە فورات و لەناو ئاوەکەدا خنکان. سامانی ئەوانی هەڵگرت و لەناو هاوەڵانی خۆی دابەشی کرد. شاعیرەکەیان لەمبارەوە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| و منا الذی غشی الدلیکة سیفه | علی حین ان اعیا الفرات کتائبه |
| و منا الذی شد الرکی لیستقی | ویسقی محضا غیر ضاف جوانبه |
| و منا غریب الشام لم یرمثله | افك لعان قد تناءی اقاربه |

واتاکەی: لەناو ئێمەدا شەڕکەرێك بوو بەشمشێرەکەی خۆی دەلیکەی داپۆشی و لەهەمان کات، پیاوە شەڕکەرەکانی ئەو فوراتیان بێزار کرد. لەناو ئێمەدا ئەو کەسە بوو هێرشی کردە سەرچاڵ تا ئاوی پاك نۆش بکات، چاڵێك کەلێوارەکانی لێوانلێو نەبوو لەئاو. لەناو ئێمەدا ناناشنای شام بوو کەوەك ئەو نەبینراوە، پێش لەهەمووان ئەو ئەسیرانەی ئازاد دەکرد کەکەسەکانی دورکەوتبوونەوە.

دەلیکە ئەسپەکەی موسەنا کوڕی حارسە بوو. ئەوەی ئاوی لەچاڵ کێشایەدەر، مورە کوڕی هەمام بوو و ناناشنای شام کوڕی قلوس کوڕی نەعمان کوڕی سەعلەبە بوو.

## شەڕی بارق

مەفزەلی زەبیی دەڵێت: منداڵەکانی تەغلەب و نەمر کوڕی قاست وچەندین دەستە لەمنداڵەکانی تەمیم شەڕی یەکیان کرد تا گەشتنە پانتایی بارق لەسوادی عێراق. چەند کەسێکیان لەناو خۆیان بەنوێنەرایەتی بۆ لای بەکر کوڕی وایل نارد و خوازیاری ئاشتی بوون. شەیبانییەکان و هاوەڵەکانیان کۆبوونەوە و مەبەستی تەغلەبییەکانیان کرد. زەید کوڕی شەریکی شەیبانی وتی: من پەنام بەخاڵۆکانی خۆم نەمری کوڕی قاستدا. ئەوان ڕێزیان لەپەنادانەکەی نەگرت و بەرێکەوتن و شەڕی منداڵەکانی تەغلەب و منداڵەکانی تەمیمیان کرد و ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت بەرادەیەك تا ئێستا تەمیمییەکان نەوەندەیان لێنەکوژرابوو. ئەسیرەکان و تالآنییەکانیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد. ئەمە، خراپترین ڕۆژی ئەوان بوو کەپیاوەکانیان کوژرا و سامانەکانیان تالآن و ژنەکانیان ئەسیر کرا. باوکی کولبەی شەیبانی وتی:

| | |
|---|---|
| و ليلة بساعدى لم تدع سندا | لتغلبى و لا انفا و لا حسبا |
| و النمر يون لولا سر من ولدوا | من آل مرة شاع الحى منتهبا |

واتاکەی: ئەو ڕۆژە لەسوعادا بیربێنەرەوە کەهیچ پشتیوان و شکۆ و نەژادێکی بۆ هیچ تەغلەبییەك بەجێنەهێشت و نەمرییەکان بیربێنەرەوە کەنەگەر لەدایك بووانیان نەدەبوو، سەرپاکیان کوشتار و تالآن کرابوو.

## شەڕی تێخفە

ئەم شەڕە مناڵەکانی یەربوع لەبەرابەر سوپاکەی نەعمان کوڕی مونزەر دەستیان پێکرد.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو (ردافت) کە لەناو عەرەبەکانی سەردەمی نەزانی وەك وەزارەت بوو و (ردیف) لەلای راستی پاشا دادەنیشت، تایبەت بوو بەمناڵەکانی یەربوع (لقێك لەتەمیمییەکان) کە لەیەك بەمیرات بۆیان دەمایەوە و بچوکەکان لەگەورەکانیان وەردەگرت. کاتێك رۆژگاری پاشایەتی نەعمان کوڕی مونزەر (یا کورەکەی مونزەر) گەشت، حاجب کوڕی زورارەی دارمی تەمیمی داوای ئەو پۆستەی لەنەعمان کرد تا بیدات بەحارس کوڕی بەیبەتی کوڕی قورتی کوڕی سوفیان کوڕی موجاشعی دارمی تەمیمی. نەعمان لەمبارەوە قسەی لەگەڵ یەربوعییەکان کرد و داوای لەوان کرد رفادت بەحارس کوڕی بەیبەت بدەن. ئەمان بەم کارە رازی نەبوون. شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان لەنزیك تێخفە بوو. کاتێك ئەوان بەم کارە رازی نەبوون، نەعمان کوڕی خۆی قابوس و براکەی حسان (هەردووك کوڕی مونزەر) نارده سەر ئەوان و سوپایەکی گەورەی لەگەڵدا بەرێکردن کەدەست پەروەردەکان و بەکرێگیراوان و خەڵکانێك لەمناڵەکانی تەمیم و کەسانیتر لەناویدا بوون. قابووس فەرماندەی سوپا و حسان فەرماندەی پێشەنگەکان. ئەمان بەرێکەوتن تا گەشتنە تێخفە و روبەروی یەربوعییەکان بوونەوە و شەڕیان کرد. مناڵەکانی یەربوع خۆراگریان کرد و قابوس و سوپاکەی شکستیان خوارد. باوکی عومەیرەی تارق لەئەسپەکەی قابوسیدا و کوشتی و قابووسی ئەسیر کرد. ویستی قژی ناوچاوی ببڕێت کەقابوس وتی: لەگەڵ شازادەکان ئاوا هەڵس و کەوتێك ناکەن. ئەو قابوسی ئازاد کرد. بیشر کوڕی عەمرۆ کوڕی جوەین، حسانی ئەسیر کرد بەڵام بەزەیی پیایدا هاتەوە و ئازادی کرد. تێکشکاوان و هەلاتووان بۆ لای نەعمان گەڕانەوە. لەم کاتەدا شێهاب کوڕی قەیس کوڕی کیاسی یەربوعی لای ئەو بوو. نەعمان پێی وت: ئەی شیهاب، کوڕ و براکەم بدۆزەرەوە کە

ەگەر ئەو دوانە بە زیندویی بدۆزیتەوە، بەداوای یەربوعییەکان رازی دەبم و رفادت بۆ ئەوان دەگەڕێنمەوە و ئەوەی کوشتویانە و تالآنیان کردووە، بەوان دەبەخشم و جیاواز لەوە دوو هەزار وشتریان پێدەدەم. شیهاب رۆشت و ئەوانی بەزیندویی بینی و ئازادی کردن وپاشا هەموو بەلێنەکانی خۆی لەگەڵ یەربوعییەکان بردەسەر و رفادتی بۆ ئەوان هێشتەوە. مالیك کوڕی نویرە وتی:

| | |
|---|---|
| و نحن عقرنا مهر قابووس بعدما | رای القوم منه الموت و الخیل تلحب |
| علیه دلاص ذات نسج و سیفه | جراز من الهندی ابیض مقضب |
| طلبنا بها انا مداریك نیلها | اذا طلب الشاؤ البعید المغرب |

واتاکەی: ئێمە ئەسپەکەی قابوسمان کوشت و ئەمە دوای ئەوە بوو خەڵکان مەرگی ئەویان بینی و ئەسپەکان دەدرەوشانەوە. جل وبەرگێکی درەخشانی جوان دوراوی لەبەردابوو، شمشێرەکەی تیژ و سپی و لەهیندەوە هێنابوویان، ئاسنی دەبڕی. ئێمە خوازیاری رفادت بووین و بەدەستمان هێنا و هەرکات مەبەستی نیشانە دوور و نەناسراوەکان بکەین، بەدەستی دێنین.

## شەڕی نیباج و سیتەڵ

باوکی عوبەیدە دەڵێت: قەیس کوڕی عاسمی تەمیمی مێنقەری هاوڕێ لەگەڵ (موقاعێس) بۆ شەڕ بەرێکەوت. ئەوان چەندین بنەماڵە لەتەمیم بەم ناوانە بوون:

سەریم، رەبیع و عوبەید کوڕانی حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی کەعب کوڕی سەعد. هەروەها هاوڕێ لەگەڵ ئەو منداڵەکانی سلامە کوڕی زەربی حیمانی لەحارسییەکان کەچەندین بنەماڵە لەتەمیم بوون وئەمانە لەناویاندا دەبینران، بۆ شەڕ بەرێکەوتن: حیمان، رەبیعە، مالیك و ئەعرەج کوڕانی کەعب کوڕی سەعد. ئەمان ڕۆشتنە شەڕی منداڵەکانی بەکر کوڕی وایل و ڕوبەڕوی لیهازم بوونەوە کەمنداڵەکانی قەیس و تیم ئەللات کوڕانی سەعلەبە کوڕی عوکابە کوڕی سەعب کوڕی عەلی کوڕی بەکر کوڕی وایل بوون. هاوڕێ لەگەڵ ئەوان منداڵەکانی زوهەل کوڕی سەعلەبە و عێجل کوڕی لوجەیم و عەنزە کوڕی ئەسەد کوڕی رەبیعە دەبینران. شەڕ لەنیباج و سیتەڵ رویدا. ئەم دوو دەستەدا هاتوچۆیان دەکرد. منداڵەکانی قەیس هێرشیان کردە سەر نیباج و منداڵەکانی سلامە ڕۆشتنە سیتەڵ تا هێرش بکەنە سەرخەڵکەکەی. کاتێك قەیس گەشتە نیباج، ئەسپەکانی خۆی ئاودا و دواتر هەموو ئاوە پاشەکەوت کراوەکەی، رژاندە سەر زەوی و بەهاوەڵانی خۆی وت: پیاوانە شەڕ بکەن چوونکە مەرگ لەبەردەمتانایە وبیابان لەپشت سەرتان. ئەو لەکاتی بەرەبەیان هێرشی کردە سەر خەڵکانی نیباج لەبەکرییەکان. بەکرییەکان پیاوانە ڕووبەڕوویان بوونەوە. بەکرییەکان شکستیان خوارد و ئەوەندە سامان وساز وبەرگ و توێشو بەدەست قەیسیەکان گەشت کە لەزۆری و فراوانیدا نەدەژمێردرا. کاتێك قەیس لەتاڵان کردنی نیباج تەواو بوو، بەپەلە ڕوی کردە سیتەڵ تا هاوکاری سەلامە و هاوەڵانی بکات. ئەوانی دۆزییەوە. هێشتا سلامە هێرشی نەکردبووە سەر خەڵکانی سیتەڵ. قەیس هێرشی کردە سەریان و شەڕیان لەگەڵدا کرد و شکستیان خوارد و قەیس تاڵانی هاوشێوەی نیباجی دەستکەوت. سلامە گەشت و وتی: ئەو کەسانەتان تاڵان کرد کەمن دەمویست تاڵانیان بکەم. ئەم دووانە مشتومڕیان کرد ئەوەندەی نەما بوو

شەڕێك هەڵگیرسێت. دواتر ڕێکەوتن کەسامانە تالأن کراوەکان بەسلامە بدەن. رەبیعە کوڕی تەریف لەمبارەوە وتویەتی:

فلا يبعدنك الله قيس بن عاصم فانت لنا عز عزيز و معقل
و انت الذى حربت بكر بن وائل و قد عضلت منها النباج و ثيتل

واتاکەی: نەبێت خوا دورت بکاتەوە ئەی قەیس کوڕی عاسم کەتۆ بۆ ئێمە بەرێز و رێزدار و قەلأیەکی بەهێزیت. تۆ بوویت بەکر کوڕی وایلت تالأن کرد و ئەمە لەکاتێکدا نیباج و سیتەڵ لەوان لیپاولیپ بوون.

قررەت کوڕی زەید کوڕی عاسم وتی:

انا ابن الذى شق المرار و قد راى بثيتل احياء الهازم حضرا
فصبحهم بالجيش قيس بن عاصم فلم يجدوا الا الاسنة مصدرا
سقاهم بها الذيفان قيس بن عاصم و كان اذا ما اورد الامر اصدرا
على الجرد يعلكن الشيكم عوابسا اذا الماء من اعطا فهن تحدرا
فلم يرها الراؤون الا فجاءة يثرن عجاجا كالدواخن اكدرا
وحمران ادته الينا رماحنا فنازع غلا فى ذراعيه اسمرا

واتاکەی: من کوڕی ئەو کەسەم کەمرار (گوڵەگەنمی) شکۆفاند و ئەمە لەکاتێکدا بوو بنەماڵەی لێهازمی لەسیتەڵ بینی. قەیس کوڕی عاسم بەسوپایەك لەبەرەبەیاندا هێرشی کردە سەر ئەوان و ئەوان جگە لەقامیشەلأن شوێنی چونەدەرەومیان نەبینی. قەیس کوڕی عاسم لەوێ ژەهری کوژەری دەرخوارددان.ئەو پیاوێکە کاتێك کەسێك دەباتە شوێنی ئاوخواردنەوە، خۆی لەوێ دەیهێنێتەدەر. سوار لەسەر ئەسپە تیژپێکان بوون و هەوسارەکانی خۆیان دەجوو و بەهۆی راکردنەوە، ئاو لەپشت و کەلەکەیانەوە دەباری. بینەران، ئەوانیان جگە بەشێوەیەکی کتوپڕ نەبینی، تەپ وتۆزیان بەرز کردەوە و بای گۆڕەپانیان هاوشێوەی دوکەڵ ڕەش کرد.

بەهۆی ڕمەکانەوە حیمران بۆ ئێمە گەڕایەوە. ئەو دەستەکانی خۆی بە بەستراوی زنجیرێك بینی کە زۆرانی لەگەڵ دەکرد.

## شەڕی فەلج

باوکی عوبەیدە دەڵێت: ئەم شەڕە بەکر کوڕی وایل لەبەرابەر تەمیم هەڵیگرساند.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو دەستەیەك لەبەکرییەکان لەزستان ڕۆشتنە شوێنە دژوار و بڵندەکان و کاتێك بەهار تێپەڕی گەڕانەوە و لەسەر دەشتی بەرین گوزەریان کرد و خەڵکانێك لەمناڵەکانی تەمیم لەمناڵەکانی عەمرۆ و حەنزەلەیان بینی. هێرشیان کردە سەر چوارپێ زۆرەکانی ئەوان و ڕۆشتن. فریادخواز ڕۆشتە لای مناڵەکانی عەمرۆ و مناڵەکانی حەنزەلە. ئەمان بۆ یارمەتیدانی خەڵکەکەی خۆیان هەڵخرێنران و بەپەلە شوێن بەکرییەکان کەوتن و دوو رۆژ و دوو شەو ڕۆشتن تا هیلاك بوون و بەرەو لای زەمینێك لەبەتن فەلج شۆڕبوونەوە. دوو پیاویان لەگەڵ دوو ئەسپی چالاکی تیژپێ هاوشێوە دیدەوان لەپشتەوە دانابوو تا ئەگەر دوژمن هێرشی کردنە سەر، ئاگاداریان بکاتەوە. کاتێك تەمیمیەکان گەشتنە دوو پیاوەکە، ئەم دوو پیاوە بەپەلە ڕۆشتن و خەڵکەکەی خۆیان ئاگادار کردەوە. کاتێك ئەوان گەشتنە فەلج، فریادخواز هات و هەواڵی بەرێکەوتنی تەمیمییەکانی راگەیاند. لەم کاتەدا حەنزەلە کوڕی یەساری عیجلی لەخێوەتەکەی خۆی هاتەدەر و خەڵکەکەی هاورێ لەگەڵ ئەو هاتن و ئامادەی شەڕ بوون. مناڵەکانی تەمیم گەشتن و مناڵەکانی بەکر کوڕی وایل بەسەختی شەڕیان لەگەڵ کردن. عەرفەجە کوڕی بوحەیری عیجلی هێرشی کردە سەر خالید کوڕی مالیك کوڕی سەلەی تەمیمی و زەرەبەیەکی لێدا و ئەسیری کرد. لەم شەڕەدا ڕێبعی کوڕی مالیك کوڕی سەلە کوژرا و تەمیمییەکان شکستیان خوارد و بەکرییەکان هەر بەلایەکیان پێخۆش بوو، بەسەر ئەواندا هێنایان.. دواتر عەرفەجە، خالید کوڕی مالیکی ئازاد کرد و قژی ناوچاوی بڕی. خالید وتی:

وجدنا الرفد رفد بنی لجیم     اذا ما قلت الارفاد زادا

هم ضربووا القباب ببطن فلج — و ذادوا عن محارمهم ذيادا
وهم منوا على طلقونى — و قد طاوعت فى الجنب القيادا
اليسوا خير من ركب المطايا — و اعظمهم اذا اجنمعوار مادا
اليس هم عماد الحى بكرا — اذا نزلت مجللة شدادا

واتاکەی: کاتێك بەخششەکان رویان لەکەمبوون و تەواو بوون کرد، بەخششی منالەکانی لوجەیمم بەباشترین بەخشش بینی. ئەوان بوون کە لەگۆڕەپانی فەلج خێوەتیان هەلدا و لەبنەماڵە و ژنانی خۆیان بەباشترین شێوە پارێزگاریان کرد. ئەوان بەزمییان بەمندا هاتەوە و لای ئەوان فەرمانبەریم دەکرد. ئایا ئەمانە باشترین خەڵکانێك نین کەسوار چوارپێکان بوون؟ ئایا ئەمانە باشترین خەڵکان لەکاتی کۆکردنەوەی خۆڵەمێش (خواردن لێنان و رێز گرتن لەمیوانەکانی خۆ) نین؟ ئایا ئەوان کۆڵەکەی بنەماڵەکەی خۆیان (بەکر) نین؟ بەکرییەکان ئەوانەن شکۆمەند روو دەکەنە گۆڕەپانی شەڕ و پیاوانە شەڕ دەکەن.

قەیس کوڕی عاسم لەسەرکۆنە کردنی خالیددا وتی:

لو كنت حرايا ابن سلمى بن جندل — نهضت و لم تقصد لسلمى ابن جندل
فما بال اصداء بفلج غريبة — تنادى مع الاطلال: يا لابن حنظل
صوادى لا مولى عزيز يجيبها — و لا اسرة تسقى صداها بمنهل
و غادرت ربيعا بفلج ملجا — و اقبلت فى اولى الرعيل المعجل
توائل من خوف الردى لا وقيته — كما نالت الكدراء من حين اجدل

واتاکەی: ئەی کوڕی سەلمی کوڕی جەندەل، ئەگەر پیاوێکی ئازاد دەبوویت، بۆ شەڕ هەڵدەستیایت نەبۆ رزگار کردنی گیانی سەلمی کوڕی جەندەل. لەکوێ بیستراون ئەو ئاوازە نەناسراوانەی لەشەڕی فەلج کەهاورێ لەگەڵ وێرانەی ماڵەکان هاواریان دەکرد: هاوار، ئەی کوڕی حەنزەل. تینو بوون و سوتاو، نەهاورێیەکی ئازمنین بوو وەلأمیان بداتەوە و نەبنەماڵەیەك کەدڵی سوتاویان بەئاوێکی پاك و سارد

دامرکێنێتەوە. ڕەبعیت لەپانتایی فەلج بەتەنیا جێهێشت و پەیکەری لەت لەت بوو. لەگەڵ یەکەم دەستەی چوارپێکان، لەگۆڕەپانی شەڕ هەڵاتیت. هەڵاتو لەترسی لەناوچوون نەکا لێی بەدور بیت بەشێوەیەك هەر لافاوێکی ماڵ وێرانکەر هەر خانەدانێك لەبناغەوە هەڵدەتەکێنێت.

کوڕی نەسیر دەڵێت: ئەو سەرکۆنەی خالید دەکات کەداوای خوێنی براکەی ڕەبیعی و کوژراوەکانی دیکەی فەلجی نەکرد. دەڵێت: ئاوازی ئەوان هێشتا بەرگوێ دەکەوێت و کەس ئاو بەوان نادات. ئەمە لەسەر ئایینی جاهلییە. ئەگەر ترسی درێژدادڕی نەبووایە، زیاتر لەمە شرۆڤەمان دەکرد.

## شەڕی شەیەتین

باوکی عوبەیدە دەڵێت: شەیەتین تایبەت بەبەکر کوڕی وایل بوو. کاتێك ئیسلام لەنەج دەرکەوت، بەکر بەرەو سواد ڕۆشت و موقایس کوڕی عومەر عایزی کوڕی عایزە لەقورەیش کە اوپەیمانی مناڵەکانی شەیبان بوو، لەشەیەتین مایەوە. کاتێك بەکرییەکان لەسواد نیشتەجێ بوون، نەخۆشی تاعون و پەتا لەناویاندا دەرکەوت. ئەم نەخۆشییانە لەرۆژگاری خوسرەو شیرویە بڵاو بوونەوە. بەکرییەکان لەوێ هەڵاتن و لەلەعلەع دابەزین. ئەم سەرزەمینە وشك و شەیەتین سەرسەوز و شادمان بوو. لەبەر ئەمە تەمیمییەکان ڕۆشتن و لەشەیەتین دابەزین. هەواڵی سەرسەوزی شەیەتین بەگوێی بەکرییەکان گەشت. ئەوان کۆبوونەوە و وتیان: هێرش دەکەینە سەر تەمیمیەکان چوونکە لەئایینی کوڕی عەبدئەلموتەلیب (یانی پێغەمبەری ئیسلام) بەمشێوەیە کەهەرکەس یەکیتر بکوژێت، لەخوێنی ئەودا دەکوژرێت. ئەم جارە هێرشیان دەکەینە سەر و دواتر دەڕۆینە سەر ئایینی ئیسلام. ئەوان لەگەڵ ژنان و مناڵان و سامانەکان لەلەعلەع بەرێکەوتن وسەرومرەکەیان بیشر کوڕی مەسعود کوڕی قەیس کوڕی خالید بوو. بەچوار شەو هاتنە شەیەتین لەکاتێکدا تا ئەوێ هەشت شەو ڕێگا بوو. پێش هەر هەواڵبەرێك کەوتنەوە و بەرەبەیان لەناکاو

هێرشیان کردە سەریان و بەسەختی شەڕیان کرد. تەمیمییەکان خۆڕاگریان کرد و سەرئەنجام شکستیان خوارد. رەشید کوڕی رومەیزی عەنبەری لەمبارەوە وتی:

و ما كان بين الشيطين و لعلع لنسوتنا الا مناقل اربع
فجئنا بجمع لم يرالناس مثله يكاد له ظهر الوديعة يطلع
بارعن دهم تنسل البلق وسطه له عارض فيه المنية تلمع
صبحنا به سعدا و عمرا و مالكا فظل لهم يوم من الشراشنع
و ذاحسب من آل ضبة غادروا بجرى كما يجرى الفصيل المفزغ
تقصع يربووع بسرة ارضنا و ليس ليربووع بها متقطع

واتاکەی: بۆ ژنانی ئێمە لەلەعلەعەوە تا شەیەتین چوار شەو زیاتر رێگا نەبوو. سوپایەکی گەورە لەئێمە کۆبویەوە کەخەڵکان هاوشێوەی ئەویان نەبینیوە بەشێوەیەك ئەوەندی نەمابوو پشتی زەوی لەقورسییەکەی شەق بەرێت. بەئەسپی لوت باریك و ڕەش کەئەسپی ڕەش و سپی لەناو ئەواندا دەدرەخشێت، ڕۆشتینە ئەو سەرزەمینە. ئەو روخسارێکی هەیە و مەرگ بەسەر دوژمندا دەبارێنێت. لەگەڵ ئەو لەکاتی بەرەبەیان هێرشمان کردە سەر سەعد و مالك و عەمرۆ و ئەوان رۆژگارێکی زیانبار و مەترسیداریان بینی. گەورەکان لەبنەماڵەی زەببە پشتیان کردە ئەوێ و بەهەلاتن ڕۆشتن بەشێوەیەك بەچکە وشترێکی ڕم کردو هەڵبێت. یەربوعییەکان لەناو سەرزەمینی ئێمە دابەزین لەگەڵ ئەوەی دەیانزانی ماڤ مانەوەیان نییە.

دواتر پێغەمبەر بۆ بەکرییەکان سەبارەت بەوەی هەیانە فەرمانی نوسی.

## شەڕەكانی ئەنسار ( شەڕەكانی ئەوس و خەزرەج )

ئەنسار (هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام)، ناوێكە بۆ دوو هۆزی ئەوس و خەزرەج كوڕانی حارسە كوڕی سەعلەبە ئەلعەنقا كوڕی عەمرۆ كوڕی موزەیقیا كوڕی عامر مائەلسەما كوڕی حارسە كوڕی ئەلغیتریف كوڕی ئەمری ئەلقەیس ئەلبەتریق كوڕی سەعلەبە كوڕی مازن كوڕی ئەزد كوڕی غەوس كوڕی نەبت كوڕی مالك كوڕی زەید كوڕی كەهلان كوڕی سەبا كوڕی یەشجب كوڕی یەعرب كوڕی قەحتان. ئەم نازناوە پێغەمبەر بەوانی بەخشی چوونكە پێغەمبەر بۆ سەرزەمینی ئەوان كۆچی كرد و ئەوان ڕێزیان لێگرت و پەنایان دا. دایكی ئەوس و خەزرەج (قیلە) كچی كاهل كوڕی عوزرەت كوڕی سەعدە و لەبەر ئەمە پێیان دەوتن كوڕانی قیلە. لەبەر ئەوەو سەعلەبەیان بەناوی (عەنقا) باڵندەی ئەفسانەیی ناوبردووە چوونكە مل درێژ بوو. عامریان بۆیە بەمائەلسەما بانگ كردووە (باران، ئاوی ئاسمان) چوونكە زۆر بەخشەر و ڕێزی لەمیوان گرتووە و وەك دەڵێن هاوشێوەی باران هەموو شوێنێكی تێراو و زیندوو دەكرد. دەستەیەك دەڵێن بەهۆی گەورەیی و ڕێزداری ئەو بوو بەم ناوە بانگ كرا. بۆیە بەئەمرۆ ئەلقەیس یان دەوت بەتریق، چوونكە یەكەم كەس بوو لەعەرەبەكان دوای بەلقیس كەمناڵەكانی ئیسرائیل داوای یارمەتیان لێكرد. لەبەر ئەمە، رەحبعەم كوڕی سلێمان كوڕی داوود كردی بەبەتریق و خەڵك ناوی بەتریقیان پێدا. نشینگەی ئەزدییەكان لە(مەئرەب) لەیەمەن بوو تا ئەوەی پێشگۆكان عومەر كوڕی عامر كوڕی موزەیقیایان ئاگادار كردەوە كە لافاوی (عەرەم) سەرزەمینەكانی ئەوان لەناو دەبات و زۆربەی خەڵكەكەی لەئاودا دەخنكێنێت چوونكە نێردراوانی خوای گەورەیان بەدرۆزن ناوبردووە. كاتێك عەمرۆ ئەمەی زانی، هەرچی زەمین و باغ و سامان و كشتوكاڵی بوو، فرۆشتی و لەگەڵ شوێنكەوتوانی خۆی لە مەئرەب ڕۆشتەدەر. دواتر ئەوان لەناو سەرزەمینەكان بڵاوبوونەوە و هەر بنەماڵەیەك شوێنێكیان بۆ خۆیان دیاری كرد و تیایدا نیشتەجێ بوون. خوزاعە لەحیجاز مایەوە و غەسان لەشام.

کاتێك سەعلەبە کوڕی عەمرۆ کوڕی عامر لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بەرێکەوت، لەمەدینە (کەپێشتر بەیەسرب ناودەبرا) تێپەریان کرد. لێرەدا ئەوس و خەزرەج کوڕانی حارسە لەگەڵ هاورێکانیان مانەوە و نیشتەجێ بوون. چەندین گوند و بازاری تیابوو و چەندین هۆز لەیەهودییەکان لەمناڵەکانی ئیسرائیل و کەسانیتر لەوێ نیشتەجێ بوون کەدەتوانین لەناو ئەوان ئاماژە بە کەلیمیەکان بدەین: مناڵەکانی قورەیزە، مناڵەکانی نەزیر، مناڵەکانی قینەقاع، مناڵەکانی ماسیلە، زەعورا و ..... ئەوان بۆ خۆیان چەندین دژ و قەلایان دروست کردبوو کە لەکاتی ترس و مەترسی پەنایان بۆ دەبرد. ئەوس و خەزرەج ڕۆشتنە لای ئەوان و قەلایان بۆ خۆیان دروست کرد. بەلام فەرمانڕەوایی و زاڵبوون لەدەست یەهودییەکان بوو تا ئەوەی فێتیون و مالیك کوڕی عجلان چەندین کاریان کرد کە بەخواستی خوا ئاماژەیان پێدەدەین. دوای ئەوە فەرمانرەوایی گەشتە دەست ئەوس و خەزرەج. ئەوان بەردەوام دۆست و هاوپەیمانی یەك بوون تا ئەوەی شەڕی سومەیر لەناو ئەوان رویدا و بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

## زاڵبوون ئەنسار بەسەر مەدینە و ناتەوان بوونی یەهودییەکان و کوژرانی فیتیون

وتمان کاتێك ئەنسار لەمەدینە دابەزین، فەرمانڕەوایی ئەم سەرزەمینە لەدەست یەهودییەکاندا بوو. بەردەوام بەمشێوە بوو تا ئەوەی فیتیون یەهودی بوو بەپاشایان. ئەو لەمناڵەکانی ئیسرائیل و دواتر لە ناڵەکانی سەعلەبە بوو. پیاوێك بوو گلاو و خراپەکار. یەهودییەکان فەرمانیان لێدەبرد و ئەو بێ رەحمانە فەرمانی بەسەردا دەکردن بەشێوەیەك هەر یەهودییەك کەژنی دەهێنا، پێش ئەوەی چێژی لێوەربگرێت، فیتیونی ستەمکار لەئامێزی دەگرت. دەڵێن ئەم کارەی لەگەڵ ئەوس و خەزرەجیش دەکرد. وا رێکەوت کەیەکێك لەخوشکەکانی مالیك کوڕی عجلانی سالمی خەزرەجی شووی کرد و کاتێك شەوی بووکێنی گەشت، لەناو ئاپۆرەی خەڵك کەبراکەیشی لەوێدا بوو، هاتەدەر و هەموو قاچی خۆی روت کرد و جوانییەکەی خستەبەرچاو. مالیك پێی وت: کارێکی ناشیرینت کرد. ژنی جوان پێی وت: ئەوەی ئەمشەو بەسەرەم دێت، لەمە ناشیرینترە. ئایا برۆمە ئامێزی کەسێکیتر جگە لەمێردەکەم؟ ئەو گەڕایەوە. براکەی مالیك ڕۆشتە لای و وتی: خوشکە، هیچ کارێکی چاکت لەدەست دێت؟ کچ وتی: بەڵێ، چیت دەوێت؟ مالیك وتی: من هاورێ لەگەڵ تۆ لەگەڵ ژنان دێم و کاتێك ژنان بڕۆنەدەر و فیتیون بێتە لای تۆ، دەیکوژم. کچ وتی: ئەم کارە بکە. کاتێك ژنان ئەویان بردە لای فیتیون، مالیك بەجل و بەرگی ژنانەوە لەگەڵ ئەواندا ڕۆشت و شمشێری لەکەمەر بەست. کاتێك ژنان هاتنەدەر و فیتیون ڕۆشتە لای ژنەکە، مالیك هێرشی کردە سەر و کوشتی و رایکرد. یەکێك لەو خەڵکە چەند دێرێکی لەمبارەوە هۆنییەوە کەیەکێیان ئەمەیە:

| | |
|---|---|
| هل كان للفطيون عقر نسائكم | حكم النصيب فبئس حُكم الحاكم |
| حتى حباه مالك بمر شة | حمراً تضحك عن نجيع قاتم |

واتاکەی: ئایا فێتیون شیاو بوو لەژنانی ئێوە چێژ وەربگرێت؟ ئەو کارەی دەکرد وەك بڵێی بەشی هەیە. خراپە ئەو فەرمانەی ئەم فەرمانداره فەرمانیداوە. سەرئەنجام شێرە پیاو( مالیك). کەرەنگێکی سوری بوو و خوێناوی بەخوێنی ڕەش و لێڵ پێدەکەنی.

دواتر مالیك کوڕی عجلان راکردوو بەرێکەوت و خۆی گەیاندە شام و ڕۆشتە لای یەکێك لەپاشاکانی غەسان بەناوی باوکی جەبیلەی عوبەید کوڕی سالم کوڕی مالیك کوڕی سالم. ئەو یەکێك لەمناڵەکانی غەزەب کوڕی جوشم کوڕی خەزەرج بوو کە لەناو ئەوان پاشایەتی و گەورەیی پێبڕا. دەستەیەك دەڵێن: ئەو پاشا نەبوو بەڵکو لای پاشای غەسان پێگەیەکی بەرزی هەبوو. ئەمە راستە چوونکە لەناو پاشاکانی غەسان ناوا کەسێك نەبینراوە. ئەویش بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا، خەرزرەجی بوو.

کاتێك مالیك ڕۆشتە لای، لەفێتیون لای ئەو گازندە و ئاگاداری کرد کەفێتیونی کوشتووە و هەنوکە چیتر ناتوانێت بۆ ماڵەوە بگەڕێتەوە. باوکی جەبیلە لەگەڵ خوا پەیمانی بەست کەبۆنی خۆش لەخۆی نەدات و نەڕواتە لای ژنان تا یەهودییەکان سوك و ریسوا بکات و ئەوس و خەزرەج بکاتە رێزدارترین خەڵکانی ئەو سەرزەمینە.

ئەو لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەشام ڕۆشتەدەر و وتی مەبەستی یەمەنی کردووە. کاتێك گەشتە مەدینە و لە(زی حۆرۆز) دابەزی، ئەوس و خەزرەجی لەمەبەستەکەی ئاگادار کردەوە. دواتر کەسێکی بۆ لای سەرۆکەکانی یەهودی نارد و ئەوانی بانگێشت کرد و وای نیشاندا دەیەوێت پاداشیان پێدات. سەرۆکەکانی ئەوان لەگەڵ کەسە تایبەتی و نۆکەرەکانی خۆیان هاتن. کاتێك لەماڵەکەی کۆبوونەوە، فەرمانیدا یەك یەك بیانبەنە لای. هەموویانی تا دوایین کەس کوشت. کاتێك ئەم کارەی لەگەڵ کردن، ئەوس و خەزەرج بوونە رێزدارترین خەڵکانی مەدینە و یەهودییەکان لەژێر دارخورماکان و ماڵەکان سوك و ریسوا بوون. رەمقی کوڕی زەیدی خەزرەجی باوکی جەبیلەی بەهۆنراوەیەکی درێژ وەسف کرد و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| و ابوو الجبيلة خير من | يمشى و اوفا هم يمينا |
| و ابرهم برأ و اعـ | ـلمهم بهدى الصالحينا |
| ابقت لنا الايام و الـ | ـحرب المهمة تعترينا |

واتاکەی: باوکی جەبیلە باشترین کەسێکە لەسەر زەویدا بەرێ دەڕوات، ئەو باشتر لەهەمووان سوێندەکەی خۆی بەجێهێنا. لەهەمووان زیاتر چاکە دەکات و لەهەمووان زیاتر کارە شایانەکان ئەنجام دەدات. ڕۆژەگارەکان ئەویان بۆ ئێمە هەڵگرت و شەڕە قورسەکانی بەسەر ئێمەدا دابارند.

## شەڕی سومەیر

ئەنسار بەردەوام یەکدڵ و تەبا و هاوپەیمان بوون. یەکەم دژایەتی و شەڕ لەناو ئەواندا رویدا، شەڕی سومەیر بوو.

هۆکاری ئەم شەڕە بەو شێوە بوو پیاوێك لەمناڵەکانی سەعلەبە لەسەعد کوڕی زوبیان کەپێیان دەوت کەعب کوڕی عجلان، ڕۆشتە لای مالیك کوڕی عجلانی سالمی. لەگەڵ ئەودا پەیمانی بەست و لەوێ مایەوە. ڕۆژێك کەعب لەماڵ هاتەدەر و ڕۆشتە بازاری قینەقاع و پیاوێکی لەغەتەفان بەئەسپێکەوە بینی. پیاو هاواری دەکرد: ئەم ئەسپە ڕێزدارترین پیاوی یەسرب بیکرێت. یەکێك دەیوت: فلان کەسە. یەکیتر دەیوت: ئۆحەیحە کوڕی جولاحی ئەوسییە و یەکیتر وتی: فلان کوڕی فلانی یەهودییە. پیاوی غەتەفانی ئەسپەکەی دا بەمالیك کوڕی عجلان. کەعب وتی: ئایا پێم نەوتن هاوپەیمانەکەی من، مالیك، باشترینە؟ پیاوێك لەئەوس لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف کەپێیان دەوت سومەیر، لەم قسە تورە بوو و جنێوی بەکەعبدا. ئەو دووانە ڕۆشتن و کەعب تا ئەو کاتەی خوا دەیویست، مایەوە.

ئەوسا کەعب مەبەستی یەکێك لەبازارەکانی ئەوانی لەقەبا کرد. سومەیر ڕۆشتە ئەوێ و وەك سێبەر بەدوای کەعبدا ڕۆشت تا بازار لەخەڵك چۆل بوو. کەعبی کوشت و مالیك کوڕی عجلانی لەکوشتنی ئاگادار کردەوە. مالیك کەسێکی بۆ لای مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف نارد و خوازیاری کوژەری کەعب بوو.

ئەوان پەیامیاندا: ئێمە نازانین کێ کوشتویەتی. خەڵکان لەناو ئەواندا هاتوچۆیان دەکرد. مالیك داوای سومەیری دەکرد و ئەوان حاشایان لەکوژرانی کەعب بەدەست سومەیر دەکرد. دواتر خوێنباییان بۆ ئەونارد و رازی بوو. خوێنبەهایی

هاوپەیمان نیوەی خوێنبایی خزم و کەس و کاربوو. مالیك داوای خوێنبایی تەواوی کرد. ئەوان رازی نەبوون و وتیان: خوێن بەهایی هاوپەیمان دەدەین کەنیوەی خوێنبایی گشتییە. هەردولا پێداگریان کرد و کێشەکە بەشەڕ کۆتایی هات. هەردوولا کۆبوونەوە و روبەرووی یەك وەستان و شەڕیان کرد و دواتر بلاوەیان لێکرد. بنەماڵەکانیتری ئەنسار پەیوەستی ئەم شەڕە بوون. دوبارە روبەرووی یەك بوونەوە و شەڕیان کرد تا ئەوەی شەو جیایی خستە نێوانیان. لەو رۆژەدا سەرکەوتن بە ئەوسییەکان بڕا.

کاتێك بلاوەیان لێکرد ئەوسییەکان کەسێکیان بۆ لای مالك نارد و داوایان لێکرد مونزەر کوڕی حەرامی نەجاری خەزرەجی بە داوەری قەبوڵ بکات (باوەگەورەی حسان کوڕی سابت کوڕی مونزەر). مالیك رازی بوو. هەردوو ڕۆشتنە لای مونزەر. ئەو بەم شێوە داوەری کرد کەخوێنبایی کەعب بەتەواوی بدەن و دواتر وەك جارانیان لێبێتەوە. ئەوان بەم کارە رازی بوون و خوێنباییان نارد و بلاوەیان لێکرد بەلأم ڕق لەدڵیاندا جێگەی خۆش کرد و دژومنایەتی رەگی داکوتا.

## شەڕی کەعب کوڕی عەمرۆ مازنی

دواتر لەنێوان منالەکانی جەحجەب لەئەوس و منالەکانی مازن لەخەزرەج شەڕ رویدا. هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو پیاوێك بەناوی کەعب کوڕی عەمرۆ مازنی ژنێکی لەمنالەکانی سالم هێنا و بەردەوام بۆ لای ئەو ژنە هاتوچۆی دەکرد. ئۆحەیحە کوڕی جولاح سەروەری منالەکانی جەحجەب فەرمانی بەدەستەیەك دا کەبۆسەیان بۆ نایەوە و کوشتیان. هەوالی ئەم کارە بەگوێی براکەی عاسم کوڕی عەمرۆ گەشت. ئەو فەرمانی بەخەلکەکەی خۆیدا. بۆ شەڕ ئامادە بوون و کەسێکیان بۆ لای منالەکانی جەحجەب نارد و بۆ شەڕ ئاگاداریان کردنەوە. ئەوان لە(ڕۆحابە) چاویان بەیەك کەوت و شەڕێکی قورسیان کرد. منالەکانی جەحجەب و هاوەڵەکانیان شکستیان خوارد و هەلأتن و ئۆحەیحەیش رایکرد. عاسم کوڕی عەمرۆ شوێنی کەوت بەلأم کاتێك پێی گەشت کەئۆحەیحە دەڕۆشتە ناو قەلاکەی خۆی. تیرێکی بۆ

هاویشت و لەدەرگای قەڵاکە چەقی. عاسم یەکێك لەبراکانی نۆحەیحەی کوشت. دوای ئەوە چەند شەوێك مانەوە و نۆحەیحە ئاگادار بوویەوە لەوەی عاسم بەدوایدا دەگەڕێت تا لەناکاو بیگرێت و خوێنی برێژێت. نۆحەیحە وتی:

| | |
|---|---|
| نبئت انك جئت تسـ | ـری بین داری و القبابه |
| فلقد وجدت بجانب الـ | ـضیحان شبانا مهابه |
| فتیان حرب فی الحـ | ـدید و شامرین کاسدغابه |
| هم نکبووك عن الطریـ | ـق فبت ترکب کل لابه |
| اعصیم لا تجزع فا | ن الحرب لیست بالدعابه |
| فانا الذی صبحتکم | بالقوم اذدخلوا الرحابه |
| و قتلت کعبا قبلها | و علوث بالسیف الذؤابه |

واتاکەی: هەواڵ بەمن گەشت کەتۆ هاتویت و لەنێوان ماڵ و خێومەتەکەی من هاتوچۆ دەکەیت. تۆ لای (ضیحان) لاوە مەترسیدارەکانت بینی. لاوانی شەڕکەر کەئاسنیان پۆشیوە و وەك شێرانی دارستان ئامادەی شەڕن. ئەوان بوون تۆیان لەرێ بەدەر کرد و ئێستا هەر کارێك ئەنجام دەدەیت. ئەی عاسمی هیچی پەست، مەگری کە شەڕ گاڵتە نییە. من بووم کاتێك شەڕکەران گەشتنە روحابە، بەرەبەیان هێرشم کردە سەریان. پێشتر شمشێرم هەڵگرت و لەناوچاوی کەعبم دا و ئەوم لەناو برد.

عاسم وەڵامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| ابلغ احیحة ان عرضـ | ـت بداره عنی جوابه |
| و انا الذی اعجلته | عن معقد الهی کلابه |
| رمیته سهما فاخـ | ـطاه و اغلق ثم بابه |

واتاکەی: ئەگەر چاوت بەئۆحەیحە کەوت لە ماڵەکەی، ئەم پەیامەی منی پێ بگەیێنە کە پێش گەشتنی سەگەکانی هێرشم کردە سەر و هەر ئەوەندەی ئەوان

سەرقاڵ بوون، بۆ شەڕ ئەو ڕۆشتم، تیرێکم بۆ هاویشت کەبەری نەکەوت بەڵام لە ترسا درگاکەی لەسەر خۆی بەست.

ئەم قەسیدەیە چەندین دێری هەیە. ئەوکات نۆحەیحە مەبەستی ئەوەی کرد لەناکاو شەوانە هێرش بکاتە سەر مناڵەکانی نەجار. سەلمی کچی عەمرۆ کوڕی زەیدی نەجاری ( دایکی عەبد ئەلموتەلیب باوەگەورێی پێغەمبەر) لەماڵەکەی ئەودا بوو. ژن بەم کارە رازی نەبوو. کاتێك شەو داهات، لەگەڵ نۆحەیحە بۆ شەو نشینی دانیشت تا خەو نۆحەیحەی بردەوە. ئەوسا سەلمی ڕۆشتە لای مناڵەکانی نەجار و ئەم هەواڵەی پێدان و گەڕایەوە. ئەوان ئاگادار بوونەوە. نۆحەیحە بەرەبەیان لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی هێرشی کردە سەر مناڵەکانی نەجار و ئەوان بەکەرەستەی شەڕ و ئامادە، روبەروی بوونەوە. شەڕێکی کەم رویدا و نۆحەیحە لەگۆڕەپانی شەڕ کشایەوە. دواتر بیستی سەلمی ئەوانی ئاگادار کردۆتەوە. لەبەر ئەمە زۆری لێدا و دەستی شکاند و بەرەلای کرد و قەسیدەیەکی هۆنییەوە کەئەم بەیتانە لەو قەسیدەیە:

| | |
|---|---|
| لعمر ابيك ما يغنى مكانى | من الحلفاء آكلة غفول |
| تؤوم لا تقلص مشمعلا | مع الفتيان مضجعه ثقيل |
| تنزع للجليلة حيث كانت | كما يعتاد لقحته الفصيل |
| و قد اعددت للحدثان حصنا | لو ان المرء ينفعه العقول |
| جلاه القين ثمت لم تخنه | مضاربه و لاطته فلول |
| فهل من كاهن اوى اليه | اذا ما حان من آل نزول |
| يراهننى و يرهننى بينه | و ارهنه بنى بما اقول |
| فما يدرى الفقير متى غناه | و ما يدرى الغنى متى يعيل |
| و ما تدرى و ان اجمعت امرا | باى الارض يدركك المقيل |
| و ما تدرى و ان انتجت سقبا | لغيرك ام يكون لك الفصيل |
| و ما ان اخوة كبروا و طابووا | لباقية و امهم هبوول |
| ستثكل او يفارقها بنوها | لموت او يجىء لهم قتول |

واتاكەی: سوێند بەگیانی باوكت كەپێگەكەم، من لەكەنیزێكی بێ شەرم و زۆربڵە و زۆرخۆر بێ نیاز ناكات. تینو دەكات و هیچ مێچكەیەكی بەپەلەی تیژپێ بەپەلە بەرێ ناكات. خەوتنی ئەو لەگەڵ لاوەكان دژوارە. من بۆ روداوە دژوارەكان قەڵایەكم ئامادە كردووە بەڵام خۆزگە عەقلی پیاو سودی پێ دەبەخشی. بەردە ئەوی لەشارەكەی دەركرد، شمشێرەكەی ئەوی ریسوا نەكرد و كەلێنەكانی شمشێر رێگەی هاتنە خواریان لێنەگرت. ئایا هیچ كاهینێك هەیە كاتێك پێشهاتێكی تاڵ بۆ بنەماڵەیەك رودەدات، بڕۆمە لای ئەو؟ لەگەڵ من گریو دەكات، ئەو كوڕەكانی خۆی هاوشێوەی بارمتە بەمن دەسپێرێت و من لەسەر ئەوەی دەیڵێم، كوڕەكانم هاوشێوەی بارمتە بەو دەسپێرم. هەژار نازانێت كەی دەوڵەمەند دەبێت و دەوڵەمەند نازانێت چ كاتێك خێزاندار و هەژار دەبێت. تۆ هەرچەندە كارەكانی خۆت بەهێز بكەیت، نازانی لەكام سەرزەمین خەوی مەرگت دەگات. تۆ نازانیت، هەرچەندە بەچكە وشترێكی نێر بزێیت، تۆ نازانیت كەهی تۆیە یا كەسێكی دیكە جگە لەتۆ. هەرچەندە براكان گەورە ببن و گەشە بكەن، كاتێك دینە گۆڕپانی شەڕ، دایكیان دڵسوتاو دەبێت. ئەو بەزویی دڵ سوتاو دەبێت و كوڕەكانی لێی جیادەبنەوە یا كوژەرێك دێت و ئەوان لەو دەرفێنێت.

## شەڕی مناڵەكانی عەمرۆ كوڕی عەوف و مناڵەكانی حارس

### ( شەڕی سەرارە )

دواتر شەڕێكی قورس لەنێوان مناڵەكانی عەمرۆ كوڕی عەوف لەئەوس و مناڵەكانی حارس لەخەزرەج رویدا.

هۆكاری شەڕەكە ئەوەبوو پیاوێك لەمناڵەكانی حارس پیاوێكی لەمناڵەكانی عەمرۆ كوشت و مناڵەكانی عەمرۆ هێرشیان كردە سەر كوژەرەكە و لەناكاو كوشتیان. كەسەكانی شوێن ئەم كارە كەوتن و زانیان چۆن كوژراوە. لەبەر ئەمە خۆیان بۆ شەڕ ئامادە كرد و كەسێكیان بۆ لای مناڵەكانی عەمرۆ كوڕی عەوف نارد و شەڕیان راگەیاند. لەسەرارە روبەروی یەك بوونەوە. فەرماندەی ئەوس حوزەیر

کوڕی سیماك باوکی ئوسەید کوڕی حوزەیر و فەرماندەی خەزرەج باوکی حباب عەبدوللە کوڕی سەلول بوو کەدوای هاتنی پێغەمبەر یەکێك بوو لەسەرکردە دووڕووەکان و خراپەخوازانی پێغەمبەر. شەڕێکی قورس رویدا و بۆ ماوەی چوار رۆژ لەبەرابەر یەك خۆڕاگریان کرد. ئەوسییەکان رویان لەماڵەکانی خۆیان کرد. خەزرەجییەکان لەم کارە شانازیان بەخۆیان کرد. حسان کوڕی سابت لەمبارەوە وتی:

فدی لبنی النجار امی و خالتی — غداة لقوهم بالمثقفة السمر
وصرم من الاحيأ عمرو بن مالك — اذاما دعوا كانت لهم دعوة النصر
فوالله لا انسى حياتى بلاءهم — غداة رموا عمرا بقاصمة الظهر

واتاکەی: فیدایی منالەکانی نەجار بن دایك و خاڵەکانی من، ئەو ڕۆژەی بەڕمە بەهێزە گیان بڕەکانیان هێرشیان کردە سەریان. دەستەیەك لەخەڵکان، کوڕانی عەمرۆ کوڕی مالیکن کەکاتێك بانگێشت دەکەن بانگێشتەکەیان سەرکەوتنی لێدەکەوێتەوە. سوێند بەخوا تا کۆتایی تەمەن شەڕە بوێرانەکەی ئەوان لەبیرناکەم. ئەو رۆژەی تیر یا ڕمێکی پشت شکێنیان بۆ عەمرۆ هاویشت و ئەویان کوشت.

هەروەها حسان وتی:

لعمر ابيك الخير، بالحق مانبا — على لسانى فى الخطوب و لايدى
لسانى و سيفى صارمان كلاهما — و يبلغ مالايبلغ السيفنذقدى
فلا الجهد ينسينى حيائى و عفتى — و لا وقعات الدهر يفللن مبردى
اكثر اهلى من عيال سواهم — و اطوى على الماء القراح المبرد

هەروەها لەم قەسیدەیە:

و انى لمنجاء المطى على الوجى — و انى لنزال لما لم اعود
و انى لقوال لذى اللوث مرحبا — و اهلا اذا ماريع من كل مرصد

واتاکەی: سوێند بەگیانی باوکت کەپێگەکەم، من لەکەنیزێکی بێ شەرم و زۆربڵە و زۆرخۆر بێ نیاز ناکات. تینو دەکات و هیچ مێچکەیەکی بەپەلەی تیژپێ بەپەلە بەرێ ناکات. خەوتنی ئەو لەگەڵ لاوەکان دژوارە. من بۆ روداوە دژوارەکان قەلایەکم ئامادە کردووە بەلام خۆزگە عەقلی پیاو سودی پێ دەبەخشی. بەردە ئەوی لەشارەکەی دەرکرد، شمشێرەکەی ئەوی ریسوا نەکرد و کەلێنەکانی شمشێر رێگەی هاتنە خواریان لێنەگرت. ئایا هیچ کاهینێك هەیە کاتێك پێشهاتێکی تاڵ بۆ بنەماڵەیەك رودەدات، برۆمە لای ئەو؟ لەگەڵ من گریو دەکات، ئەو کورەکانی خۆی هاوشێوەی بارمتە بەمن دەسپێرێت و من لەسەر ئەوەی دەیڵێم، کورەکانم هاوشێوەی بارمتە بەو دەسپێرم. هەژار نازانێت کەی دەوڵەمەند دەبێت و دەوڵەمەند نازانێت چ کاتێك خێزاندار و هەژار دەبێت. تۆ هەرچەندە کارەکانی خۆت بەهێز بکەیت، نازانی لەکام سەرزەمین خەوی مەرگت دەگات. تۆ نازانیت، هەرچەندە بەچکە وشترێکی نێر بزێیت، تۆ نازانیت کەهی تۆیە یا کەسێکی دیکە جگە لەتۆ. هەرچەندە براکان گەورە ببن و گەشە بکەن، کاتێك دینە گۆرپانی شەر، دایکیان دڵسوتاو دەبێت. ئەو بەزویی دڵ سوتاو دەبێت و کورەکانی لێی جیادەبنەوە یا کوژەرێك دێت و ئەوان لەو دەرفێنێت.

## شەری مناڵەکانی عەمرۆ کوری عەوف و مناڵەکانی حارس
## ( شەری سەرارە )

دواتر شەرێکی قورس لەنێوان مناڵەکانی عەمرۆ کوری عەوف لەئەوس و مناڵەکانی حارس لەخەزرەج رویدا.

هۆکاری شەرەکە ئەوەبوو پیاوێك لەمناڵەکانی حارس پیاوێکی لەمناڵەکانی عەمرۆ کوشت و مناڵەکانی عەمرۆ هێرشیان کردە سەر کوژەرەکە و لەناکاو کوشتیان. کەسەکانی شوێن ئەم کارە کەوتن و زانیان چۆن کوژراوە. لەبەر ئەمە خۆیان بۆ شەر ئامادە کرد و کەسێکیان بۆ لای مناڵەکانی عەمرۆ کوری عەوف نارد و شەریان راگەیاند. لەسەرارە روبەروی یەك بوونەوە. فەرماندەی ئەوس حوزەیر

کوڕی سیماك باوکی ئۆسەید کوڕی حوزمیر و فەرماندەی خەزرەج باوکی حباب عەبدوللە کوڕی سەلول بوو کەدوای هاتنی پێغەمبەر یەکێك بوو لەسەرکردە دووڕووەکان و خراپەخوازانی پێغەمبەر. شەڕێکی قورس رویدا و بۆ ماوەی چوار رۆژ لەبەرابەر یەك خۆڕاگریان کرد. ئەوسییەکان رویان لەماڵەکانی خۆیان کرد. خەزرەجییەکان لەم کارە شانازیان بەخۆیان کرد. حسان کوڕی سابت لەمبارەوە وتی:

فدی لبنی النجار امی و خالتی — غداة لقوهم بالمثقفة السمر
وصرم من الاحیاً عمرو بن مالك — اذاما دعوا کانت لهم دعوة النصر
فوالله لا انسی حیاتی بلاءهم — غداة رموا عمرا بقاصمة الظهر

واتاکەی: فیدایی مناڵەکانی نەجار بن دایك و خاڵەکانی من، ئەو ڕۆژەی بەڕمە بەهێزە گیان بڕەکانیان هێرشیان کردە سەریان. دەستەیەك لەخەڵکان، کوڕانی عەمرۆ کوڕی مالیکن کەکاتێك بانگێشت دەکەن بانگێشتەکەیان سەرکەوتنی لێدەکەوێتەوە. سوێند بەخوا تا کۆتایی تەمەن شەڕە بوێرانەکەی ئەوان لەبیرناکەم. ئەو ڕۆژەی تیر یا ڕمێکی پشت شکێنیان بۆ عەمرۆ هاویشت و ئەویان کوشت.

هەروەها حسان وتی:

لعمر ابیك الخیر، بالحق مانبا — علی لسانی فی الخطوب و لایدی
لسانی و سیفی صارمان کلاهما — و یبلغ مالایبلغ السیفنذقدی
فلا الجهد ینسینی حیائی و عفتی — و لا وقعات الدهر یفللن مبردی
اکثر اهلی من عیال سواهم — و اطوی علی الماء القراح المبرد

هەروەها لەم قەسیدەیە:

و انی لمنجاء المطی علی الوجی — و انی لنزال لما لم اعود
و انی لقوال لذی اللوث مرحبا — و اهلا اذا ماریع من کل مرصد

و انی لیدعونی الندی فاجیبه — و اضرب بیض العارض المتوقد
فلا تعجلن یا قیس و اربع فا نما — قصاراك ان تلقی بکل مهند
حسام و ارماح بایدی اعزة — متی ترها یا ابن الخطیم تلبد
اسود لدی الاشبال یحمی عرینها — مراعیس بالخطی فی کل مشهد

واتاکەی: سوێند بەگیانی باوکت چاکی و راستی و دروستی لەکاتی پێشهاتە گیانبڕەکان لەزمانی من نەسڕایەوە. زمان و شمشێرەکەم هەر دوو کیان بڕەڕن. ڕمەکەم لەوشوێنە دەچەقێت کەشمشێر کاریگەری دانانێ. نەهیلاکی و لەناوچونی شەرم، داوێن پاکیم لەبیر دەباتەوە و نەپێشهاتە تاڵەکانی رۆژگار هەسانەکەی من کول دەکات. کەسەکانم لەنانخۆرەکان زیاد دەکەم (نان خۆرانی دیکە پەیوەستی نان خۆرانی خۆم دەکەم) و بەناوی پاك رۆژگار بەسەر دەبەم و بەسەندەی پێ دەکەم. من چوارپێ شەڕکەرەکان هەرچەندە سمەکانیان سوابێت، بەرەلا دەکەم و ئەوەی پەسەندی نەکەم، بەجێی دێڵم و بەسەختی شەڕی لەگەڵ دەکەم. بە زۆرداران و ئەو شەڕکەرانەی لەهەموو شوێنێك دەرکراون، دەڵێم، دەس خۆش بەخێر بێن. بەخشین بانگێشتم دەکات و وەڵامی دەدەمەوە وبۆ میوانەکان ئاگر هەڵدەگیرسێنم و وشترە قەڵەوەکان سەردەبڕم. ئەی قەیس پەلە مەکە و خۆراگر بە چوونکە خراپترین بەلا کە بەسەر تۆبێت ئەوەیە بەشمشێری هندی هێرش بکەنە سەرت. شمشێر و ڕمەکان لەدەست پیاوانێکی بەرێز کەهەر کات ( ئەی کوڕی خەتیم) ئەوان دەبینی، دەبینی و تێدەگەییت بەهایان چەندە. وەك شێرن لەنزیك بەچکە شێرەکانی خۆیان، پاسەوانی ماڵەکەی خۆیان دەکەن و لەهەر شەڕ و جەنگێك بەڕمی (**خطی** ) ( دروست کراوی گوندی **خطی** بەحرەین) زەربە دەوەشێنن.

ئەم قەسیدەیە دێری زۆرە. قەیس کوڕی خەتیم بەمشێوە وەڵامی دایەوە:

تروح عن الحسناء ام انت مغتدی — و کیف انطلاق عاشق لم یزود
تراءت لنا یوم الرحیل بمقلة — شرید بملتف من السدر مفرد

| | |
|---|---|
| وجيد كجيد الريم حال يزينه | علة النحر ياقوت و فص زبرجد |
| كان الثريا فوق ثغرة نحرها | توقد فى الظلماء اى توقد |
| الا ان بين الشر عبى و راتج | ضرابا كتجذيم السيال المصعد |
| لنا حائطان الموت اسفل منهما | و جمع متى تصرخ بيثرب يصعد |
| ترى اللابة السوداء يحمر لونها | و يسهل منها كل ربع و فدفد |
| فانى لاغنى اْالناس عن متكلف | يرى الناس ظلالا و ليس بمهتد |
| لساء عمرا ثورا شقيا موعظا | الد كان راسه راس اصيد |
| كثير المنى بالزاد لا صبر عنده | اذا جاع يوما يشتكيه ضحى الغد |
| و ذى شيمة عسراء خالف شيمتى | فقلت له دعنى و نفسك ارشدى |
| فما المال و الاخلاق الا معارة | فما اسطعت من معروفها فتزود |
| متى ماتقد بالباطل الحق يابه | فان قدت بالحق الرواسى تنقد |
| اذا ما اتيت الامر من غير بابه | ظللت و ان تدخل من الباب تهتد |

واتاکەی: ئایا ئێوارێیە کەلای دولبەری دڵڕفێن دێیتەوە یا بەیانییە؟ چۆن شەیدایەك کەتوێشوی هەڵنەگرتبێت، دەگەڕێتەوە؟ لەرۆژی جیابوونەوە بەچاوێکی حەیران و سەرگەردان لەبەرابەر ئێمەدا دەرکەوت و پرچە هۆنراوەکانی، بەگەردنێك هاوشێوەی ئاسکەکان، گەردنێکی بەرز کە لەسەر قورگی یاقوت و زەبەرجەد بوو. دەتوێت ئەستێرەی سوهەیلە لەسەر چاڵی قورگی دەدرەوشێتەوە هاوشێوەی ئاگرێك کە لەتاریکیدا هەڵیانگیرساندبێت، روناکی بوو. لەناو تەپۆلکەکانی شەرعبی و راتج شەڕ و هەرایەکە کەئاوازێکی هاوشێوەی ئاوازی بڕینی چقڵەکانی لێوە بەرز دەبێتەوە. ئێمە دوو دیوار بەستمان هەیە بەیەسرب کەمەرگ دابارین لەوێوەیە و دەستەیەك، کەهەرکات داوای یارمەتییان لێبکەیت، هاوشێوەی باڵندەکان بۆ ئاسمان دەفڕن. زەوی بەبەردەڵانێکی ڕەش دەبینی کە لەزیانی ئەوان سوردەبێت و هەر دەشت و بیابانێك بەرێکی و تەختی.... سەرسەختە وەك بڵێی لە لەخۆبایی بوونەوە ناتوانێت سەری دانەوێنێت. زۆر تامەزرۆی توێشوە و ئۆقرەی نییە بەشێوەیەك کاتێك برسی بێت، تا نیمەڕۆی بەیانی زمان بۆ گلەیی ناکاتەوە. ئەویتریان عادەتێکی ناسازگاری بوو لەگەڵ عادەتەکەی من کەپێم وت:

لەمن خۆشبە و ڕێنوێنی خۆت بکە. سامان و عادەت و ئاکار دەکرێت لەهەر شوێنێك بەدەستیان بهێنیت، هەرچەندە دەتوانی، لەبەشە باشەکانی ئەم دوانە زیاتر هەڵبگرە. ئەگەر مەبەستت بێت ڕاستی و دروستی بکەیتە فەرمانبەری کەژی و چەوتی، خۆی دوور دەخاتەوە بەلاّم ئەگەر بەراستی و دروستی بانگی کێوەکان بکەیت، دەبنە فەرمانبرداری تۆ. ئەگەر بۆ هەر کارێك لەرێگای خۆیەوە نەچیت، گومڕا دەبیت و ئەگەر لەرێگەی خۆیەوە بڕۆیت، پێی دەگەیت.

ئەم قەسیدەیە دوور و درێژە. عوبەید کوڕی ناقد دەڵێت:

لمن الديار كانهن المذهب  بليت و غيرها الدهور تقلب

کە تیایدا دەڵێت:

لكن فرار ابى الحباب بنفسه  يوم السرارة سيء منه الاقرب
ولى و التى يوم ذلك درعه  اذ قيل جاء الموت خلفك يطلب
نجاك منا بعد ما قد اشرعت  فيك الرماح هناك شد المذهب

واتاکەی: ئەم ماڵانە هی کێ بن؟ دەڵێی بوونەتە خۆڵە پۆتە، لەناوچون و سوڕانی رۆژگار گۆرانکاری بەسەر ئەواندا هێناوە. بەلاّم هەلاّتنی باوکی حباب لەرۆژی شەڕی سەرارە، کارێك بوو هەموو نزیکەکان لایان ناپەسەند بوو. کاتێك پێیان وت: مەرگ لەپشت سەرت وەستاوە و بەدوای تۆدا دەگەڕێت، زرێکەی فرێدا و هەلاّت. دوای ئەوەی ڕمەکانی ئێمە بۆ نێچیر کردنی تۆ هەڵگران و درەوشانەوە، هەلاّتی و لەهەلاّتن پەلەت کرد.

قەسیدەیەکی دور و درێژ. باوکی حباب هەمان عەبدوللە کوڕی سلولە.

## شەڕی حەسین کوڕی ئەسلەت

دواتر لەنێوان منالّەکانی وایل کوڕی زەید لەئەوسییەکان و منالّەکانی مازن کوڕی نەجار لەخەزرەجییەکان شەڕ رویدا.

هۆکاری شەڕەکە ئەوەبوو حەسین کوڕی ئەسلەتی ئەوسی وایلی شەڕی لەگەڵ پیاوێك لەمنالّەکانی مازن کرد و کوشتی و گەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی. دەستەیەك لەمنالّەکانی مازن شوێنی کەوتن و ئەویان کوشت. هەواڵی ئەم کارە بەگوێی براکەی، باوکی قەیس کوڕی ئەسلەت گەشت. ئەو خەلّکەکەی خۆی کۆکردەوە و کەسێکی بۆ لای منالّەکانی مازن نارد و ئاگاداری کردنەوە دەیەوێت شەڕیان لەگەڵدا بکات. ئەوان ئامادەی شەڕ بوون و هیچ کەس لەئەوس و خەزرەج خۆی نەدزییەوە. شەڕێکی قورسیان کرد کە لەهەردولا ژمارەیەکی زۆر کوژران و باوکی قەیس کوڕی ئەسلەت کەبراکەیان کوشتبوو، کوژرا. ئەوسییەکان شکستیان خوارد. وەحوح کوڕی ئەسلەت سەرکۆنەی براکەی خۆی یانی باوکی قەیسی کرد و وتی: بەردەوام لەخەزرەجییەکان شکست دەخۆیت. باوکی قەیس بەبراکەی باوکی حەسینی وەحوحی وت:

| | |
|---|---|
| ابلغ ابا حصن و بعـ | ـض القول عندی ذوکباره |
| ان ابن ام المرء لیـ | ـس من الحدید و لا الحجاره |
| ماذا علیکم ان یکو | ن لکم بها رحلا عماره |
| یحمی ذمارکم و بعـ | ـض القوم لا یحمی ذماره |
| یبنی لکم خیرا و بنیا | ن الکریم له اثاره |

واتاکەی: پەیامێکم هەیە بە باوکی حەسینی بگەیێنی چوونکە هەندێ وتە لای من گرانە و ناسازگار. کوڕی دایکی تۆ لەئاسن یا بەرد نییە. ئێوە چیتان بەسەر دێت ئەگەر لەشەڕدا خێومتێکی ئاوەدانتان بێت، تا پاسەوانی مالّەکەی ئێوە بکات هەرچەند هەندێ کەس پاسەوانی لەماڵی خۆیان ناکەن تا بۆ ئێوە بینایەکی بەرز

دروست بكات چوونكە هەر ڕێزدارێك نیشانێك لەخۆی بەجێدێڵێت.

## شەڕی ڕەبیعی زەفەری

دواتر لەنێوان منالەكانی زەفەر لەئەوس و منالەكانی مالك لەخەزرەج شەڕ ڕویدا.

هۆكارەكەی ئەوەبوو ڕەبیعی زەفەری هاوڕێ لەگەڵ بار، یا بارەكان لەسامانی پیاوێك لەمنالەكانی نەجار بەرەو سەرزەمینی خۆی بەرێكەوت. پیاوێكی نەجاری ڕێگەی ئەم كارەی لێگرت. پرسەكەیان بەشەڕ كۆتایی هات و ڕەبیع ئەو پیاوەی كوشت. خەڵكی هەردولا كۆبوونەوە و شەڕێكی قورسیان كرد كە لەهەموو شەڕەكان دژوارتر بوو. منالەكانی مالك كوڕی نەجار شكستیان خوارد و قەیس كوڕی خەتیمی ئەوسی لەمبارەوە وتی:

اجد بعمرة غنيانها      فتهجرام شاننا شانها
فان تمس شطت بها دارها      و باح لك اليوم هجرانها
فما روضة من رياض القطا      كان المصابيح حوذانها
وعمرة من سروات النسا      ء ينفخ بالمسك اردانها

و دەڵێت:

و نحن الفوارس يوم الربيـ      ـع قد علموا كيف ابدانها
جنونا لحرب وراء الصر      يخ حتى تقصد مرانها

واتاكەی: ئایا بەراستی عەمرۆ دەیەوێت دڵدارێك هەڵبژێرێت و لەكەسانیتر بەو بەسەندە بكات یا ئەو كار وپێویستی بەئێمە هەیە. كاتێك ڕۆژ بكەیتە شەو، دەبینیماڵەكەت لەو دور كەوتۆتەوە و ئەوە ڕۆژێكە هەست بەدوری ئەو بكەیت و كاریگەر دابنێت. هیچ بێستانێك لەبێستانەكانی (قتا) كە (حوزان) ( گوڵی بەرگ زەرد)ەكە وەك چرا بدرەوشێتەوە، باشتر لەعەمیرە نییە.

خۆشتر لەعەمرە نییە. عەمرە لەژنانی گەورە زادەی ئێمەیە، بۆنی خۆشی سەر و سینەی ئەو هۆش لەهەر کەس دەرفێنێت. ئێمە سوارکارانی شەڕی رەبیعین. خۆیان دەزانن پەیکەرەکانیان چەند خێرا کەوتۆتە سەر زەوی. پیاوانی ئێمە شێت ئاسا بۆ یاری ستەم لێکراوان دەڕۆن تا لاسکی گیاکانی بشکێت و هەڵوەرێت.

ئەم قەسیدەیە دوور و درێژە. حسان کوڕی سابتی خەزرەجی بەم قەسیدەیە وەڵامی دایەوە کەسەرەتاکەی بەمشێوەیە:

| | |
|---|---|
| لقد هاج نفسك اشجانها | و غادرها اليوم اديانها |

و:

| | |
|---|---|
| و يثرب تعلم انا بها | اذا التبس الحق ميزانها |
| و يثرب تعلم انا بها | اذا اقحط القطر نو آنها |
| و يثرب تعلم اذ حاربت | بانا لدى الحرب فرسانها |
| و يثرب تعلم ان النبيـ | ـت عند الهزاهز ذلانها |

و:

| | |
|---|---|
| متى ترنا الاوس فى بيضنا | نهر القنا تخب نيرانها |
| و تعط القياد على رغمها | و تنزل ملهام عقبانها |
| فلا تفخرن التمس ملجا | فقد عاود الاوس اديانها |

واتاکەی:... گیانت دەبزوێنێت، و گیانت هەڵدەخرێنێت و ئەمرۆ ئایینەکانی کار و شێوەکانی هەڵس و کەوتی ماڵئاواییان لێکرد. یەسرب باش دەزانێت کاتێك تەرازوی راستی و دروستی هەڵواسرێت و پۆشراوبێت، ئێمە لەوێ ئامادە دەبین. یەسرب دەزانێت ئەگەر ئاوی باران هێرش نەکاتە سەر ئاوبەندەکان، ئێمە لەوێ دەبین و کاری باران دەکەین. یەسرب لەکاتی شەڕ دەزانێت ئێمە سوارکارانی ئەوین. یەسرب دەزانێت کەنەبیت (یانی عەمرۆ کوڕی مالك کوڕی ئەوس) لەبگرە و بێنە و شەڕەکان لەکەسە پەستەکانی ئەوە. هەرکات ئەوسییەکان ئێمە لەخودەکان بەشمشێرە ئاودراوە سپیەکان ببینن، ئاگری شەڕئەنگێزی ئەوان دادەمرکێتەوە.

بەریسوایی ئەو هەوسارە بەیەکیتر دەدرێت و لاشخۆرەکانی دادەبەزن تا لاشەی مردووەکانیان بکەنە خۆراك. ئیتر شانازی بەخۆت مەکە، بەشوێن پەناگایەك بگەرێ چوونکە نابینەکانی ئەوس بۆ یەسرب گەڕاوەتەوە.

## شەڕی فارع لەسەر کوڕی قوزاعی

یەکێك لەشەڕەکانی عەرەبەکان لەسەردەمی جاهلی (نەزانی)، شەڕی فارغ بوو.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو پیاوێك لەمناڵەکانی نەجار، کوڕیکی لەقوزاعە لە (بلّی) کوشت. مامی ئەم کورە پەنای بردبووە بەر مەعاز کوڕی نەعمان کوڕی ئەمری ئەلقەیسی ئەوسی باوکی سەعد کوڕی مەعاز. کوڕ هاتە لای مامی خۆی تا بیبینێت و پیاوی نەجاری گرتی و کوشتی. مەعاز کەسێکی بۆ لای مناڵەکانی نەجار نارد و پەیامی دا: یا خوێنبایی پەنابەرەکەی من بدەن یا بکوژ تەسلیم بکەن تا بزانم چی لەگەڵدا بکەم. ئەوان بەم داوایە رازی نەبوون. پیاوێك لەمناڵەکانی عەبد ئەلئەشهەل وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم کارە نەکەن، جگە لەعامر کوڕی ئەتنابە ناکوژین ( و ئەم پیاوە لەگەورەکانی خەزرەج بوو). ئەم وتە بەگوێی عامر کوڕی ئەتنابە گەشت و ئەمەی وت:

الا من مبلغ الا كفاء عنى — و قد تهدى النصيحة للنصيح

فانكم و ما ترجون شطرى — من القول المزجى و الصريح

سيندم بعضكم عجلا عليه — و ما اثر اللسان الى الجروح

ابت لى عزتى و ابى بلائى — و اخذى العهد بالثمن الربيح

و اعطائى على المكروه ما لى — و ضربى هامة البطل المشيح

و قولى كلما جشات و جاشت: — مكانك تحمدى او تستريحى

لا دفع عن ماثر صالحات — و احمى بعد عن عرض صريح

بذى شطب كلون الملح صاف — و نفس لا تقر على القبيح

واتاکەی: کێیە وتاری من بەهاوتاکان بگەیێنێت چوونکە هەندێ کات کەئاموژگاری بۆ چاکەخواز دەنێرین، رازی دەبێت. ئێوە بەو وتە ئاشکرا و نەرمانە کەسەبارەت بەداوا کردنی خوێنی من وتوتانە، دەستەیەکتان لەو خێراییەی لەم کارەدا کردوتانە پەشیمان دەبنەوە چوونکە هەندێ کات برینی زمان لەبرینی تیر کاریگەرترە. رێزداربوونی من و بەئەزموون بوونی من رێزم لێدەگرێت چوونکە من وەسف کردن بەبەهای گران دەکرم. لەبەرابەر دژوارییەکان سامان دەدەم و لەناوچاوی پاڵەوانی گرژ و مۆن شمشێر دەدەم. کاتێك با دەکاتە خۆی و دەخروشێت، پێی دەڵێم: لەشوێنی خۆت ئارام بگرە کەوەسفی تۆ دەکەن یا لانی کەم خۆت ئاسودە دەکەیت. من مەبەستمە پاسەوانی لەعادەتی باش و ناوی چاکە بکەم و پاسەوانی ناوبانگی خۆم و هاوشێوەی کەسێکی گەورە و بەخشەر سەروەری خەڵکەکەم بم و لەئابروی راست بەرگری بکەم بەشمشێرێکی ناودار کەوەك رەنگی خوێ پاك و رۆشنە، بەگیانێك کە لەبەرابەر بینینی کاری ناشیرین ئارام ناگرێت.

رەبیع کوڕی ئەبی حەقیقی یەهودی لەبەرابەر ئەم وتارەی عامر کوڕی ئەتنابە بەمشێوە وەلامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| الا من مبلغ الاكفاء عنى | فلا ظلم لدى و لا افتراء |
| فلست بغائظ الاكفاء ظلما | و عندى للملمات اجتزاء |
| فلم ار مثل من يدنو لخسف | له فى الارض سيرؤ استواء |
| و ما بعض الاقامة فى ديار | يهان بها الفتى الاعناء |
| و بعض القول ليس له عناج | كمحض الماء ليس له اناء |
| و بعض خلائق الاقوام داء | كداء الشح ليس له دواء |
| و بعض الداء ملتمس شفاء | و داء النوك ليس له شفاء |
| يحب المرء ان يلقى نعيما | و يابى الله الا ما يشاء |
| و من يكعاقلا لم يلق بؤسا | ينخ يوما بساحته القضاء |
| تعاوره بنات الدهر حتى | تثلمه كما ثلم الاناء |
| و كل شدائد نزلت بحى | سياتى بعد شدتها رخاء |

فقل للمتقی عرض المنايا : توق فليس ينفعك اتقاء
فما يعطی الحريص غنی بحرص و قدينمی لدی الجود الثراء
و ليس بنافع ذا البخل مال و لا مرز بصاحبه الحياء
غنی النفس ما استغنی بشیء و فقر النفس ما عمرت شقاء
يود المرء ما تفد الليالی كان فناء هن له فناء

واتاكەی: کێیە وتاری من بەهاوتاکانم بگەیێنێت چوونکە نەمەبەستی ستەم کردنم هەیە نەدەمەوێت درۆ بۆ کەسێك هەڵبەستم. مەبەستم نییە لەرێگەی ستەم کردنەوە هاوتاکانی خۆم تورە کەم و لەبەرابەر پێشهاتە ناسازگارەکان، ئەومندەم نییە، بێ نیاز بم. کەسم لەمە روو رەشتر نەبینیوە بەریسوایی رازی بێت و ئارام و بەهێز هەنگاو هەڵبگرێت. هەندێ کات مانەوە لەسەرزەمینێك، ئەگەر بەریسواییەوە بێت، جگە لەرەنج و مەینەتی بەرهەمی دیکەی نابێت. هەندێ لەوتەکان هیچ بنەماییێکیان نییە تا خۆیانی پێوە هەڵواسن ((سست و بێ بنەمان))، وەك ئاوێکی پاك و بەتام کەشەونەمی نەبێت و لەبەر ئەمە برژێتە سەر زەوی. دەستەیەك لەعادەتی خەڵکان ئازاردەرە وەك ئازاری زێر پەرەستی کەدەرمانی نییە. بۆ هەندێ لەنەخۆشییەکان دەتوانرێت دەرمانێك بدۆزرێتەوە بەڵام نەخۆشی نەزانی و پەستی دەرمانی بۆ نییە. پیاو بەردەوام دەیەوێت سامانێکی زۆری هەبێت بەڵام خوا جگە لەمەبەستەکەی خۆی بەکار نابات. هەر کەس بیرمەند بێت، گرفتاری بەدبەختی نابێت هەرچەند رۆژێك لەرۆژان چارەنوسی (مەرگ) وشتر لەبەردەم ماڵەکەیدا بخەوێنێت. کشانی رۆژگار (شەو و رۆژ) بەردەوام لێی تێدەپەرن تا بیشکێنن بەوشێوەی شەونم لەزوەی بدەن و لەت لەتی بکەن. هەرچەند دژوارییەکان کە بەسەر بنەماڵەیەك دێت، دوای ئەو دژوارییە رۆژگاری ئاسودەیی رویان تێدەکات. بەو کەسەی لەمەرگ رادەکات بڵێ: خۆ بپارێزە کەخۆپاراستن لەمەرگ هیچ سوودێك بەتۆ ناگەیێنێت. ئەوەی تەماحی زێر و زیوی فراوانی هەیە، لەم رێگاوە دەوڵەمەند نابێت چوونکە بەردەوام لەکاتی بەخشندەییدایە سامانەکان زیاد دەکەن. ئەوەی زێر دەپەرستێت، سامانەکەی سودی پێ نابەخشێت و ئەوەی شەرم نیشان بدات، بەسوکی

نازانن. ئەوەی دڵی بێ نیاز بێت، لەهەموو شتێك بێ نیازە بەڵام هەژاری گیان، تا کۆتایی ژیان هۆکاری بەدبەختییە. پیاو بەردەوام پێی خۆشە شەوەکان بگەن (پەلە دەکات تائەو رۆژە هەرچی زوتر بێت) بەڵام نازانێت تێپەربوونی ئەوان هەمان تێپەر بوونی ژیانی ئەوە.

کاتێك نەعمان کوڕی مەعاز بینی منالەکانی نەجار نەخوێنبایی دەدەن و نەبکوژ تەسلیم بەبنەماڵەی کوژراو دەکەن، خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. ئەو و خەڵکەکەی کەرەستەی شەڕیان هەڵگرت و لەشوێنێك بەناوی فارغ جەنگیان کرد. فارغ قەڵایەکی حسان کوڕی سابت بوو. شەڕەکە سەخت و درێژەی کێشا تا ئەوەی عامر کوڕی ئەتنابە خوێنبایی دا. کاتێك ئەم کارەی کرد هەر دولای شەڕ ئارامیان گرت و گەڕانەوە سەر دۆخی جاران. عامر کوڕی ئەتنابە لەمبارە وتی:

صرمت ظليمة خلتى و مراسلى — و تباعدت ضنا بزاد الراحل
جهلا و ماتدرى ظليمة اننى — قد استقل بصرم غير الواصل
ذلل ركابى حيث شئت مشيعى — انى اروع قطا المكان الغافل
اظليم ما يدريك ربة خلة — حسن ترغمها كظبى الحائل
ما بت مالكها شارب قهوة — درياقة رويت منها و اغلى
بيضاء صافية برى من دونها — قعر الاناء يضىء وجة الناهل
و سراب هاجرة قطعت اذا جرى — فوق الاكام بذات لون باذل
اجد مراحلها كان عفاءها — سقطان من كتفى ظليم جافل
فلنا كلن بناجز من مالنا — و لنشر بن بدين عام قابل
انى من القوم الذين اذا انتدوا — بداوا ببرالله ثم النائل
المانعين من الختى جيرانهم — و الحاشدين على طعام النازل
و الخالطين غنيهم بفقيرهم — و الباذلين عطاء هم للسائل
و الضاربين الكبش يبرق بيضه — ضرب المهند عن حياض الناهل
و العاطفين على المصاب خيولهم — و الملحقين رماحهم بالقاتل
و المدركين عدوهم بذحورهم — و النازلين لضرب كل منازل
و القائلين معا خذوها اقرانكم — ان المنية من وراء الوائل

خزر عيونهم الى اعدائهم — يمشون مشى الاسد تحت الوابل
ليسوا بأكناس و لاميل اذا — ما الحرب شبت اشعلوا بالشاعل
لا يطبعون و هم على احسابهم — يشفون بالاحلام داء الجاهل
و القائلين فلا يعاب خطيبهم — يوم المقالة بالكلام الفاصل

واتاكەی: نازەنینی من (زەڵیمە) رشتەی هاورێیەتی و پەیك و پەیامەکانی منی پچراند و دورکەوتەوە توێشوی رێبواری لەمن درێغ کرد. ئەم کارەی لەنەزانییەوە کرد چوونکە زەڵیمە نازانێت من خۆم هەندێ کات رشتەی خۆشەویستی دەپچرێنم و ئەو کەسەی خوازیاری بینینم نەبێت، بەرەڵا دەکەم. لەسەر سەمەندە تیژپێ و بلەزەکان سواردەبم و بۆ هەر شوێنێك بمەوێت، دەڕۆم، ئەوەندە خێرا دەڕۆم کە ەلی ئاگرخۆرە ددتارێنم. ئەی زەڵیمە، تۆچی دەزانی، چەند فراوان ژنی جوانی وەك تۆ کە بەهاورێیەتی گرتم و تورە بوونەکەیشی خۆش بوو، وەك ئاسکێك کە لەگەڵ نێرەکەیدا جوت بووبێت بەڵام سکی پڕنەبووبێت. شەوم دەکردە رۆژ و ئەوم لەئامێزدا بوو و بادەم دەخواردەوە و تینویەتی خۆم بەم و بەو دادەمرکاند. بادەیەکی سپی و باك کە لەناوییەوە، قوڵایی جامەکە دەبینرا و روخساری بادەنۆشی گەش دەکرد. چەند فراوان تراوێلکە ئاو نوێنەکانم لەنیمەڕۆ گەرمەکاندا پێوا وبەئەسپە خۆش رەنگەکەی خۆم تەپۆڵکەکانم پشت سەرنا. ماڵ بەماڵی ئەو، زەمینە نارێکە و ناڵەبارەکان بوو، ئەو پەڕ و باڵانەی لەهەر شوێنێکیدا پرژ وبڵاو بوون، شانەی وشترملێك بوو. بێ گومان ئێمە بە شادمانی خواردن دەخۆین و بەفەرزی ساڵی داهاتوو بادە. من لەو خەڵکەم کاتێك بەخشەندەیی بکەنە پیشە، بەناوی خوا دەست پێدەکەن و دواتر رودەکەنە کەسانیتر. زیان لەهاوسێکانی خۆیان دوردەکەنەوە و خەڵکانێکی زۆر بانگێشتی سەر سفرەکەی خۆیان دکەن. دەوڵەمەند و هەژار تێکەڵ دەکەن و بەخشینەکانی خۆیان تایبەت بەپرسیارکەر دەکەن. پاڵەوانی دوژمن بەشمشێری درەخشان و سپی لەناو دەبەن بەهەمان شێوەکە بەشمشێری هیندی پاسەوانی لەناوگرەکانی خۆیان دەکەن. هەوساری ئەسپەکانی خۆیان بۆ گۆڕەپانی شەڕ دەسوڕێنن و ڕمی خۆیان لەقەبرغەی کوژەر دەچەقێنن.

گەمارۆی دوژمن دەدەن و داوای خوێنبایی لێدەکەن و بۆ روبەرو بوونەوە بۆ شەڕ لەئەسپ دادەبەزن. هەمووان پێکەوە بەیەك دەنگ دەڵێن گەمارۆی شەڕکەرانی رکەبەر بدەن چوونکە مەرگ لەوێ دادەبەزێت کە(وایل) بۆ شەڕ دەوەستێت. بەچاوی نیوە کراوە لەدوژمن دەڕوانن و هاوشێوەی شێرێك کە لەژێر بارانی زۆر رێگەی روبار و ترسیان نییە، هەنگاو لەسەر زەوی دادەنێن. نەسست و ناتەوانن و نەلاریێ دەڕۆن. کاتێك ئاگری شەڕ هەڵگیرسێت، بەدەسەچیلەیەك هێرشی دەکەنەسەر. دڵەکانیان لەراستی و دروستی خراپ ناڕوانێت و رێز لەنەژادی خۆیان دەگرن. دەردی نەزان بەزانایی خۆیان چاك دەکەنەوە. وتاردەرانی پایەبەرزن کە لەکاتی وتاردان، کەس وتاردەری ئەوان بەکەمی و هەڵیت و پڵیت بێژی ناکاتە قسەی سەر زمانان.

## شەڕی حاتب

ئەوسا شەڕێکی ناودار بەناوی حاتب رویدا. ئەو حاتب کوڕی قەیس لەمناڵەکانی ئومەییە کوڕی زەید کوڕی مالیك کوڕی عەوف ئەوسی بوو. لەنێوان ئەم شەڕە و شەڕی سومەیر سەد ساڵ ماوە بوو. لەم ناوەدا چەندین شەڕ رویدا کەئەوانەی گرنگ بوون ئاماژەمان پێدان و ئەوەی گرنگ نەبوو، پشت گوێمان خست. جگە لەشەڕی (بووعاس) شەڕی حاتب دوایین شەڕی ئەوان بوو تا خواوەند ئیسلامی بۆ ناردن.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەمە بوو:حاتب پیاوێکی رێزدار و گەورە بوو. پیاوێك بە مناڵەکانی سەعلەبە کوڕی سەعد کوڕی زوبیان گەشت و لای ئەو دابەزی. ئەم پیاوە رۆژێك رۆشتە بازاری مناڵەکانی قینقاع. یەزید کوڕی حارس ئەوی بینی. ئەم یەزیدەیان بەکوڕی فۆسحۆن ناودەبرد کەدایکی بوو. ئەو لەمناڵەکانی حارس کوڕی خەزرەجە. یەزید بەپیاوێکی یەهودی وت: عاباکەی خۆم بەتۆدەدەم ئەگەر ئەم پیاوە سەعلەبیی تێهەڵدان بکەیت. ئەو عاباکەی وەرگرت و هاتە ناو بازار و بەشێوەیەك لەو پیاوەی دا کەهەموو بازار ئاگادار بوونەوە. پیاوی سەعلەبی هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی حاتب، بەشەق لەمیوانەکەتانیاندا ریسوایان کرد! حاتب لەم کارە ئاگادار بوویەوە. هاتە لای ئەو و پرسی: کێ لەتۆیداوە؟ ئەو یەهودییەکەی بەدەست نیشاندا. حاتب هات و بەشێوەیەك بەشمشێر لەپیاوە یەهودییەکەیدا کەناوچاوی تەقی. کوڕی فۆسحۆم ئەمەی بیست و پێی وترا کەحاتب یەهودی کوشت. ئەو شوێن حاتب کەوت و کاتێك پێی گەشت کەرۆشتبووە ماڵی کەسەکانی خۆی. پیاوێکی لەمناڵەکانی معاویە بینی و دەستبەجێ کوشتی. شەڕ لەنێوان ئەوس و خەزرەج رویدا و هەردوك کۆبوونەوە و خۆیان تەیار کرد و لەسەر پردی (ردم مناڵەکانی حارس کوڕی خەزرەج) روبەروی یەك بوونەوە. فەرماندەی خەزرەج لەم رۆژەدا عەمرۆ کوڕی نەعمانی بیازی و فەرماندەی ئەوس، حوزەیر کوڕی سیماکی ئەشهەلی. هەواڵی ئەم شەڕەی ئەوان بەخەڵکانی دەوروبەریان لەعەرەبەکانی ئەو سەرزەمینە گەشت. لەبەر ئەمە عویەیینەت کوڕی حسن کوڕی حوزەیفە کوڕی

بەدری فەزاری و خیار کوڕی مالك کوڕی حمادی فزاری سوار بوون و هاتنە مەدینە و سەبارەت بەئاشتی ئەوس و خەزرەج گفتوگۆیان کرد و دەستەبەری ئەومیان کرد هەرکەس داوای هەرچی لەویتر بکات، بیدەن. ئەوان رازی نەبوون و شەڕەکان لەشوێنی پرد رویدا. خیار و عویەیینە لەوێ ئامادە بوون. ئەوان لەدژواری و سەختی شەڕەکان زۆر شتیان بینی کە لەئاشتی بێ هیوابوون. لەم رۆژەدا سەرکەوتن بەخەزرەجییەکان بڕا. ئەمە یەکێك لەناودارترین شەڕەکانی ئەوانە. دوای ئەوە چەند شەڕێکی دیکە رویاندا کەهەموویان لەشەڕی حاتبەوە سەرچاومیان گرت. لەو شەڕانە دەتوانین ئاماژە بەم شەڕانەی خوارەوە بدەین:

## شەڕی رەبیع

دوای شەڕ لەپرد، ئەنسار لەشوێنێك بەناوی رەبیع روبەروی یەك بوونەوە. ئێرە ناوی بێستانێك لەداوێنی تەپۆڵكە بوو. شەڕێكی قورسیان كرد بەرادەیەك ئەوەندەی نەمابوو یەكتر لەناو ببەن. ئەوسییەكان شكستیان خوارد و و هەلاتن. خەزرەجییەكان شوێنیان كەوتن تا گەشتنە ماڵەكانی ئەوان. پێشتر هەركات یەك لەو دوو سوپایە شكستی دەخوارد و روی لەماڵەكانی خۆی دەكرد، سوپاكەیتر دەستی لەشەڕ هەڵدەگرت. كاتێك خەزرەجییەكان تا نزیك ماڵەكان شوێن ئەوسییەكان كەوتن، داوای ئاشتیان كرد. تیرەی مناڵەكانی نەجار لەخەزرەج بەئاشتی رازی نەبوو. ئەوسییەكان ژن و مناڵەكانی خۆیان لەناو قەلاكاندا راگرت. لەم كاتەدا خەزرەجییەكان وازیان لێ هێنان. سەخر كوڕی سەلمانی بەیازی لەمبارەوە وتی:

الا ابلغا عنی سوید بن صامت و رهط سوید بلغا و ابن الاسلت
بانا قتلنا بالربیع سراتكم و افلت مجروحا به كل مفلت
فلو لا حقوق بالعشیرة انها ادلت بحق واجب ان ادلت
لنالهم منا كما كان نالهم مقانب خیل اهلكت حین حلت

واتاكەی: لەمن بەسوەید كوڕی سامت و دارودەستەكەی سوەید و كوڕی ئەسلەت بلێن. بلێن ئێمە لەگۆرەپانی رەبیع گەورەكانی ئێوەمان كوشت و هەر كەس گیانی بەدەربرد، بریندار بوو. مەگەر ئەئەوە بوو ئێمە لەناو هۆز مافێكی شیاومان بوو كە دەبووا پارێزراو بێت. لەئێمە بەئێوە ئەوە دەگەشت كە ێشتر بەسەرتان هاتبوو، ئەو كاتەی ئەسپەكانمان بەسم هێرشیان كردە سەر دەستەی ئێوە و لەناویان بردن.

سوەید كوڕی سامت وەلامی دایەوە:

الا ابلغا عنی صخیرا رسالة فقد ذقت حرب الاوس فیها ابن اسلت

فقتلنا سراياكم بقتلى سراتنا      و ليس الذى ينجو اليكم بمفلت

واتاکەی: لەمن بەسەخری کەم و بێ بەها بڵێن تۆ تامی شەڕی ئەوس و کوڕی نەسلەتت چێشت. ئێمە گەورەکانی ئێوەمان لەبەرابەر گەورەکانی خۆمان کوشت و ئەوەی لەدەست ئێمە رزگاری بوو، بۆ لای ئێوە پاشەکشێی کرد.

یەك لەشەڕەکانیتر بەقیع بوو.

## شەڕی بەقیع

دواتر ئەوس و خەزرەج لە(بەقیع غەرقەد) روبەروی یەك بوونەوە و شەڕێکی قورسیان کرد. لەم رۆژەدا ئەوسیسەکان سەرکەوتن. عوبەید کوڕی ناقدی ئەوسی وتی:

لما رأيتبنى عوف و جمعهم      جاؤا و جمع بنى النجار قدحفلوا
دعوت قومى و سهلت الطريق لهم      الى المكان الذى اصحابه حللوا
جادت بانفسها من مالك عصب      يوم اللقاء فما خافوا و لافشلوا
و عاوروكم كؤوس الموت اذ برزوا      شطر النهار و حتى ادبر الاصل
حتى استقاموا و قد طال المراس بهم      فكلهم من دماء القوم قد نهلوا
تكشف البيض عن قتلى اولى رحم      لو لا المسالم و الارحام ما نقلوا
تقول كل فتاة غاب قيمها :      اكل من خلفنا من قومنا قتلوا
لقد قتلتم كريما ذا محافظة      قد كان حالفه القينات و الحلل
جزل نوافله حلو شمائلة      ريان و اغله تشقى به الابل

واتاکەی: کاتێك منداڵەکانی عەوف و دەستەکانی ئەوانم لەگەڵ منداڵەکانی نەجار بینی کەبۆ شەڕ کۆببوونەوە، خەڵکی خۆم کۆکردەوە و رێگام بۆ تەخت کردن تا هاتنە ناو گۆڕەپان و لەبەرابەر دوژمن ریزیان بەست. لەهۆزی مالك چەندین دەستە

گیانبازییان کرد و لەرۆژی شەڕ خۆڕاگریان کردە پیشە ونەترسان و سست نەبوون. کاتێك دەرکەوتن، بەردەوام بادەی مەرگیان دەرخواردی ئێوەدا، لەنیمەڕۆوە تا درەنگانێکی شەو. تا ئەو کاتە خۆڕاگرییان کرد و درێژەیان پێدا و هەمووان لەخوێنی دوژمن شادان بوون. پەردە لەسەر ئەو کوژراوانە هەڵگیرا کە لەخزمەکان بوون. ئەگەر ئاشتی خواز و خزم نەدەبوون، هیچ کەس جەستەی ئەوانی لەگۆڕەپان نەدەبردەدەر. هەر کچێکی گەنج کەسەرپەرەستەکەی خۆی لەدەست دابوو، دەیوت: ئایا هەموو شەڕکەرانی ئێمە کوژراون؟ ئێوە پیاوێکی گەورە و پارێزراوتان کوشت کە لەهەموو ژیانیدا هاوئامێزی کچانی مانگ روخسار و زێر و زیودار بوو. بەخشینەکانی ئەو فراوان و عادەتە باشەکانی زۆر بوون، کەسێك کە لەکاتی مەیخواردنەوە دەهاتە لای، شادان لەسەر خواردنەوە هەڵدەستا. وشتری بلەز لەژێر رانەکانی ئەو بێزار دەبوو.

عەبدوڵە کوڕی رەواحەی حارسی خەزرەجی بەمشێوە وەڵامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| لما رأيتبنة عوف و اخوتهم | كعبا و جمع بنى النجار قدحفلوا |
| قدما ابا حوا حماكم بالسيوف و لم | يفعل بكم احد مثل الذى فعلوا |

واتاکەی: کاتێك مناڵەکانی عەوف و براکانیان منالەکانی کەعب و دەستەی منالەکانی نەجارم بینی کەبۆ شەڕ کۆبوونەتەوە، زانیم لەدێر زەمانەوە خێوەتەکانی ئێوەیان بەشمشێر دڕیوە و کەس ئەوەی لەگەڵ ئێوە نەکرد کەئەوان کردیان.

سەرکردەی ئەوس لەوکاتەدا لەشەڕ، حاتب باوکی قەیس کوڕی ئەسلەتی وایلی بوو. شەڕی دەسپێکرد و خۆی لەئاسوودە ی دوور خستەوە. دواتر روخساری گۆڕا و رەنگی پەڕی. رۆژێك هاتە لای ژنەکەی و نەیناسیەوە بەڵام دواتر بەدەنگ ئەوی ناسی. ژن وتی: تا قسەت نەکرد، تۆم نەناسییەوە. کوڕی ئەسلەت وتی:

قـالت و لم تتصدلقيل الخنا : مهلا فقد ابلغت اسماعی
و استنكرت لونا له شاحبا والحرب غول ذات اوجاع
من يذق الحرب يجد طعمها مرا و تتركه بجعجاع
قد حصت البيضة راسی فما اطعم نوما غير تهجاع
اسعی علی جل بنی مالك كل امریء فی شأنه ساعی
اعددت للاعداء موضونة فضفاضة كالنهی بالقاع
احفرها عنی بذی رونق مهند كاللمع قطاع
صدق حسام وادق حده و منحن اسمر قراع

واتاكەی: ژنەكەم وتی - نەیدەویست خراپ بڵێت -: كەمێك چاوەڕێ بە تا دەنگی تۆ ببیستم و بتناسمەوە. ڕەنگی لێڵی منی بەناپەسەند زانی، بەڵێ، شەڕ دێوێكی ئازاردەرە. ئەوكەسەی شەڕ بچێژێت، تامەكەی دەزانێت، شەڕ ئەو دەخاتە تەنگانەوە. موی سەرم سپی بووە و جگە لەخەوێكی سووك، ئارامم نییە. لەبەرابەر هەموو منداڵەكانی مالك تێدەكۆشم، هەركەسێك لەكاری خۆیدا كۆشایە. لەبەرابەر دوژمنان زرێیەكی بەربڵاو و ڕازاوەم هەیە كەهاوشێوەی ئاوگیرێك لەبیابان دەدرەوشێتەوە. بەشمشێری هیندی و ئاودراو دەیپارێزم كەدرەوشانەوەی هەیە و تا دڵ بخوازێت تیژە. ڕاست كردارە، تیژە، بڕەرە، چەماوەیە، گیانبڕە و بەردەوام خودە و زرێ دەكوتێت.

قەسیدەیەكی دوور و درێژە. دواتر باوكی قەیس كوڕی ئەسلەت ئەوسییەكانی كۆكردەوە و پێی وتن: من نەبوومە سەركردەی هیچ خەڵكێك مەگەر ئەوەی شكستیان خوارد، یەكێتر بكەنە سەركردەی خۆتان. ئەوان حوزەیر كەتایب كوڕی سیماكی ئەشهەلی باوكی ئوسەید كوڕی حوزەیریان كردە سەركردەی خۆیان. كوڕەكانی لەهاوەڵانی پێغەمبەر بوون و ئوسەید كوڕی حوزەیر لەهاوەڵانی بەدری (ئامادە لەشەڕی بەدر) بوو. حوزەیر سەرپەرەستی كاروباری شەڕی ئەوانی دەكرد. دواتر ئەوس و خەزرەج لەشوێنێك بەناوی (غرس) شەڕیان كرد كەسەركەوتن بە ئەوسییەكان بڕا. لەمبارەوە پەیكی ئاشتی و پەیامیان بۆ یەكتر نارد و لەسەر ئەمە

بنەمایە ئاشتیان کرد کە ژمارەی کوژراوەکان بەدەست بێنن و هەر کام شەڕکەری زیاتری لێ کوژرابوو، بەو ئەندازەیە خوێنبایی وەربگرێت. ئەوس لەخەزرەج سێ کوژراوی زیاتربوو. خەزرەجییەکان سێ کوڕیان وەك بارمتەی خوێنبایی بەواندا بەڵام ئەوسییەکان خیانەتیان کرد و سێ کوڕەکەیان کوشت.

## فەجاری یەکەمی ئەنسار

ئەم شەڕە لەگەڵ فەجاری قەیس و کەنانە پەیوەندی نییە. کاتێك ئەوسییەکان ئەو کوڕانەیان کوشت، خەزرەجییەکان کۆبوونەوە و لە(حدایق) روبەرویان بوونەوە. فەرماندەی خەزرەج، عەبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وفەرماندەی ئەوس، باوکی قەیس کوڕی ئەسلەت. شەڕێکی قورسیان کرد بەمەبەستی لەناو بردنی یەکتر. ئەمەیان بەیەکەم فەجار (گوناحکاری) ناوبرد لەبەر ئەوەی خیانەتیان کرد و ئەو سێ کوڕەیان کوشت. قەیس کوڕی خەتیم لەبێستانەکەی خۆیدا بوو و کاتێك گەڕایەوە بۆ شەڕ، بینی خەڵکەکەی بۆ شەڕ رۆشتونەدەر. ئەو لەوەرگرتنی کەرەستەی شەڕ ناتەوان و تەنیا شمشێری هەڵگرت و لەگەڵ ئەوان ڕۆشت. لەم رۆژەدا پێگەی بەرزبوویەوە چوونکە زۆر باش شەڕی کرد و لەچەند شوێنێکی جەستەی بریندار بوو. ماوەیەك ژیا وتیماری کرد. فەرمانی پێدرا لەخواردنەوەی ئاو خۆبپارێزێت. لەبەر ئەمە عەبدولله کوڕی رەواحە وتی:

رميناك ايام الفجار فلم تزل حميا فمن يشرب فلست بشارب

واتاکەی: رۆژی فەجار تیرمان بۆت هاویشت و ناچار بوویت خۆت بپارێزیت بەشێوەیەك هەمووان ئاو دەخۆنەوە و تۆ ناتوانیت.

## شەڕی موعەبەش و موزەرەس

دواتر لەشوێنێك بەناوی موعەبەس و موزەرەس چاویان بەیەك كەوت. ئەمانە ناوی دوو دیوارن. خەزرەج لەپشت موزەرەس و ئەوس لەپشت موعەبەس بوو. چەند رۆژێك مانەوە و شەڕیان كرد و ئەوسییەكان شكستیان خوارد و رویان لەماڵ و قەلاكان كرد. شكانێكی گەورەبوو و هیچ كات بەوشێوەیە تێك نەشكابوون. دواتر منالەكانی عەمرۆ كوڕی عەوف و منالەكانی ئەوس كوڕی مەنات لەگەڵ خەزرەجییەكان ئاشتیان كرد بەلام منالەكانی عەبد ئەشهەل و منالەكانی زەفەر و چەندین دەستەی دیكە لەبنەماڵەكانی ئەوس بەئاشتی رازی نەبوون و وتیان: تا خوێنی خۆمان وەرنەگرین، ئاشتی ناكەین. خەزرەجییەكان لەئازاردان و تالآن كردنی ئەوان پێداگریان كرد تا منالەكانی عەمرۆ كوڕی عەوف و ئەوس كوڕی مەنات بەئاشتی رازی بوون. ئەوسییەكان جگە لەمانەی ئاماژەمان پێدان، ویستیان لەمەدینە كۆچ بكەن. لەم كاتەدا منالەكانی سەلە لەسەرمێرگەجارێكی چڕ بەناوی (رەعل) لەگەڵ منالەكانی عەبد ئەشهەل كە اوەنی مێرگەجارەكە بوون، شەڕیان كرد. سەعد كوڕی مەعازی ئەشهەلی بەقورسی برینداربوو و منالەكانی سەلە هەڵیان گرت و بردیانە لای عەمرۆ كوڕی جەموحی خەزرەجی كە پەنایدا و مێرگەجارەكەی لەبڕین و سوتاندن پاراست. كاتێك شەڕی بەعاس هاتە پێش، بەهەمان شێوە كەئاماژەی پێدەدەین، سەعد پاداشی پێدا.

ئەوسییەكان ڕۆشتنە مەككە تا ببنە هاوپەیمانی قورەیشیەكان. بەمشێوەیان نیشان دا كەمەبەستی حەجی عەمرەیان لەسەردایە. شێوەی ئەوان بەمجۆرە بوو كاتێك یەكێك دەبەستی عەمرە یا حەجی دەكرد، دوژمن ئازاری پێ نەدەگەیاند و ئەو كەسەی بۆ عەمرە دەڕۆشت بێخی لقی دارخورمای بەخێوەتەكەی خۆیەوە هەڵدەواسی. ئەوان ئەم كارەیان كرد و بەرەو مەككە بەرێكەوتن و لەگەڵ قورەیشیەكان بوونە هاوپەیمان. لەم كاتەدا باوكی جەهل لەمەككە نەبوو، كاتێك گەڕایەوە، بەم كارە رازی نەبوو و وتی: مەگەر وتەی پێشینانتان نەبیستووە كەدەڵێن:: هاوار لەخانەخوێ لەدەست میوان! ئەمان لەژمارەدا زیاترن و هێزی

زیاتریان هەیە. هەرجار کەخەڵکانێك دەڕۆنە لای خەڵکانێکیتر بەسەریاندا زاڵ دەبن و ئەوانیان دەرکردووە. وتیان: چۆن پەیمانەکەی خۆمان بشکێنین؟ وتی: من چارەی ئەم کارە دەکەم. دواتر ڕۆشتە لای ئەوسییەکان و وتی: ئێوە لەگەڵ خەڵکەکەی من پەیمانتان بەستووە و من لێرە نەبووم. هاتوم لەگەڵ ئێوە پەیمان ببەستم و سەبارەت بەخۆم بڵێم تا لەمەدوا پابەندی بن. ئێمە خەڵکانێکین بەردەوام کەنیزەکانمان دەڕۆنە بازار و بەردەوام پیاوێك خۆی بەوان دەگەیێنێت و بەدەست لەسمتیان دەدات. ئەگەر ڕێگەی ئەم کارە لەگەڵ ژنەکانتان دەدەن، پەیوەستی ئێمە بین تا ببینە هاوپەیمانی ئێوە. ئەگەر ڕازی نابن، پەیمانەکەتان هەڵبووەشێنینەوە. وتیان: ئەمە پەسەند ناکەین و بەرەوای نازانین. هەموو ئەنسار سەبارەت بەژنانی خۆیان دەمارگیر بوون. ئەوسییەکان پەیمانەکەیان لەگەڵ قورەیشییەکان هەڵوەشاندەوە و گەڕانەوە. حسان کوڕی سابت شانازی بەخەڵکەکەی خۆی کرد کەچییان لەگەڵ ئەوسییەکان کردووە . دەڵێت:

| | |
|---|---|
| الا ابلغ ابا قيس رسولا | اذا القى لها سمعا تبين |
| فلست لحاصن ان لم تزركم | خلال الدار مسبلة طحون |
| يدين لها العزيز اذا راها | و يهرب من مخافتها القطين |
| تشيب الناهد العذراء منها | و يسقط من مخافتها الجنين |
| يطوف بكم من النجار اسد | كاسد الفيل مسكنها العرين |
| يظل الليث فيها مستكينا | له فى كل ملتف انين |
| كان بهاءها للناظريها | من الاثلاث و البيض الفتين |
| كانهم من الماذى عليهم | جمال حين يجتلدون جون |
| فقد لا قاك قبل بعاث قتل | و بعد بعاث ذل مستكين |

واتاکەی: کێیە لەمن بۆ باوکی سەعد پەیامێك ببات، ئەم پەیامە کاتێك ببات کەگوێی بۆ رادێرێت. من پارێزەری خەڵکەکەی خۆم نەبم ئەگەر شەڕێك بەسەر ئێوەدا دانەبارێت کەخوێن ببارێنێت و ئێوە لەناو ببات. کاتێك رێزدار بیبینێت، ملی پێ دەسپێرێت و کاتێك دانیشتو بیبینێت، رادەکات. کچی کچێنی نەپرژاوی مەمك

قوت لەترسی پیر دەبێت و منالی ناوسك لەترسا دەکەوێت. لەنەجارییەکان شێرەکان هێرش دەکەنە سەر ئێوە کەشێرانی دارستان دەکەنە کونەکەی خۆیان. شێر لەناوا شەڕێك دەبێتە ڕێوی و لەناو ئەم شەڕەدا دەگریت. وەك بلێی گلەیی بۆ بینەرەکانی هاوشێوەی شمشێرە تیژ وسپی و برەڕەکانی هەمان شەڕ بێت. ئەو پیاوە شەڕکەرانە ئەوەندە لەناو کەرەستە ئاسنییەکانی شەڕ ڕۆچوون بەشێوەیەکن دەلێی لەکاتی شەڕ کردن بەشمشێرەکان، وشترانێکی ڕەش یا سپین کەباری ئاسنیان پێیە. پێش لەبەعاس کوشتار رویکردە تۆ و دوای ئەوە ریسوایی هەمیشەیی.

## فەجاری دووەمی ئەنسار

ئەوسییەکان داوایان لەمنالەکانی نەزیر و منالەکانی قورمیزە کردبوو لەبەرابەر خەزرەجییەکان لەگەڵیان ببنە هاوپەیمان. ئەم هەواڵە بەخەزرەجییەکان گەشت و شەڕیان راگەیاند. یەهودییەکان وتیان: ئێمە خوازیاری شەڕ نین. خەزرەجییەکان بارمتەیان لێگرتن تا لەسەر بەلێنەکەی خۆیان بمێننەوە. بارمتەکان چل کوڕ لەمنالەکانی نەزیر و منالەکانی قورمیزە بوون. رۆژێك یەزید کوڕی فۆسحۆم بادەی خواردەوە و مەست بوو و شێعرێکی خوێند و ئەم روداوەی بیرهێنایەوە:

| | |
|---|---|
| هلم الا الاحلاف اذرق عظمهم | و اذاصلحوا مالا لجذمان ضائعا |
| اذا ما امرؤ منهم اساء عمارة | بعثنا عليهم من بنى العير جادعا |
| فاما الصريخ منهم فتحملوا | و اما اليهود فا تخذنا بضائعا |
| اخذنا من الاولى اليهود عصابة | لغدرهم كانوا لدينا ودائعا |
| فذلوا لرهن عندنا فى حبا لنا | مصانعة يخشون منا القوارعا |
| و ذاك بانا حين نلقى عدونا | نصول بضرب يترك العز خاشعا |

واتاکەی: برۆنە لای هاوپەیمانەکان کە ئێسقانەکانیان سست و سامانێکی زۆریان بەپەیمان شکێنندا کە لەناو دەچن. ئەگەر یەك لەوان هەڵس و کەوتێکی خراپ بگرێتە بەر، بەشمشێر رەگ و ریشەی دەقرتێنین. فریاد خوازەکانیان کۆچیان کرد و

یەهودییەکانمان کردە کاڵای خۆمان. لەیەهودییەکان دەستەیەکمان بەبارمتە گرت تا لەبەرابەر فێڵەکانیان لای ئێمە بن. لەتەنافەکانی ئێمە وەك بارمتە بمێننەوە و ریسوا و سازگار بن چوونکە لەهاتنە خوارەوەی شمشێرەکانی ئێمە دەترسن. ئەمە لەبەر ئەوەیە کاتێك ئێمە روبەروی دوژمنانی خۆمان بووینەوە بەشێوەیەك لەوان دەدەین کەرێزداره لەخۆ بووردوەکان کردیان.

ئەم وتەیە بەگوێی منالەکانی نەزیر و منالەکانی قورەیزە گەشت و ئەوان تورە بوون. کەعب کوڕی ئەسەد وتی: ئێمە بەوشێوەین کەشاعیر ئاماژەی پێداوە (ئەگەر هێرش ناکەیتە سەر ئەوان، ئەوسیەکانیان ئاوقا بکە). کاتێك خەزرەجییەکان ئەم وتەیان بیست، هەموو بارمتەکانی خۆیان لەکوڕەکانی منالەکانی نەزیر و منالەکانی قورەیزە کوشت و ژمارەیەك لەوانیان ئازاد کرد کەلە ناو ئەوان سولەیم کوڕی ئەسەدی قورەزی باوەگەوڕێی محەممەد کوڕی کەعب کوڕی سولەیم دەبینرا. لەم کاتەدا ئەوسییەکان و منالەکانی نەزیر و منالەکانی قورەیزە بۆ شەڕ لەگەڵ خەزرەجییەکان بوونە هاوپەیمان و شەڕێکی قورسیان کرد کە بەفەجاری دوەمی ئەنسار ناوبرا چوونکە خەزرەجییەکان کورە بێ تاوانە یەهودییەکانیان کوشت.

سەبارەت بەکوشتنی ئەم کوڕانە ئاماژەیان بەگێرانەوەیەکی دیکەیش داوە: عەمرۆ کوڕی نەعمانی بیازی خەزرەجی بەخەڵکەکەی خۆی منالەکانی بەیازەی وت: باوکتان ئێوەی هێنایە شوێنێکی خراپ. سوێند بەخوا سەر و جەستەم بەئاو نەشۆم تا ئێوە لەناو ماڵەکانی منالەکانی نەزیر و منالەکانی قورەیزە نیشتەجێ بکەم یا بارمتەکانی ئەوان بکوژم. ماڵەکانی منالەکانی نەزیر و منالەکانی قورەیزە لەباشترین سەرزەمینەکان بوو. ئەو پەیامی بۆ منالەکانی نەیزر و منالەکانی قورەیزە نارد: یا ماڵەکانی خۆتان بەئێمە بسپێرن یا بارمتەکان دەکوژین. ویستیان لەماڵەکانی خۆیان برۆنەدەر. کەعب کوڕی ئەسەدی قورەزی پێی وتن: ئەی خەڵکینە، ماڵەکانی خۆتان بپارێزن و رێگە بدەن کوڕەکانی ئێوە بکوژن. یەك شەو بۆ ئەم کارە بەسە کە ئێوە برۆنە ئامێزی ژنەکانی خۆتان و کوڕیکی هاوشێوەی ئەو کورە کوژراوانە دروست بکەن! ئەمان وەلامیان دایەوە: ئێمە لەماڵەکانی خۆمان کۆچ ناکەین، لەبارمتەکانی ئێمە بڕوانن و رێز لەقسەکەی ئێمە بگرن و لەگەڵ ئەوان بەداد پەروەری هەڵس و

کەوت بکەن. عەمرۆ کوڕی نەعمان هێرشی کردە سەر بارمتەکان و ئەوانی کوشت. عەبدالله کوڕی ئەبی سەلوول بەم کارەی رازی نەبوو، وتی: ئەم کارە بێدادگەری و گوناحە. ئەوانی لەکوشتنی ئەوان و شەڕ کردن لەگەڵ ئەوسییەکان دوور دەخستەوە. پێی وت: دەڵێی تۆ دەبینم کەپەیکەرە کوژراوەکەتیان لەعابایەکەوە پێچاوە و چوار پیاو لەسەر شان هەڵیدەگرن. ئەو و ئەوانەی فەرمانیان لەو دەبرد هیچ کام لەکوڕە یەهودییەکانیان نەکوشت بەڵکو ئازادیان کرد، لەوانە: سولەیم کوڕی ئەسەد باوەگەوڕێی محەممەد کوڕی کەعب. لەم کاتەدا منداڵەکانی نەزیر و منداڵەکانی قورەیزە بۆ شەڕ لەگەڵ خەزرەجییەکان لەگەڵ ئەوسییەکان یەکیان گرت. شەڕێکی قورس رویدا کە بەفەجاری دووەم ناسرا. ئەم گێرانەوەیە راستترە تا ئەم شەڕە بەفەجار ناو ببرێت. بەپێی گێرانەوەی یەکەم، ئەوان بارمتەکانیان لەبەرابەر فریوی یەهودییەکان کوشت. کەواتە ئەو شەڕە بۆ خەزرەجییەکان فەجار نەبوو مەگەر لەبەر ئەوە بەفەجار ناو ببرێت کەیەهودییەکان پەیمانی خۆیان شکاند.

## شەڕی بەعاس

منداڵەکانی نەزیر و منداڵەکانی قورەیزە پەیمانی خۆیان لەگەڵ ئەوس سەبارەت بەپاڵپشتی و هاوکاری تازە کردەوە و بەهێز بوون و لەشەڕەکان هەوڵیان دەدا. هۆزەکانی دیکە لەیەهوودییەکان جگە لەمانە پەیوەستیان بوون. کاتێك خەزرەجییەکان ئەمەیان بیست، کۆبوونەوە و هێزەکانی خۆیان ئامادە کرد و بۆ هاوپەیمانەکانی خۆیان لەئەشجەع و جوهەینە پەیك و پەیامیان نارد. ئەوسییەکان کەسیان بۆ لای هاوپەیمانەکانی خۆیان لەموزەینە نارد. چل رۆژ مانەوە و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. لەشوێنێك بەناوی بەعاس لەگوندەکانی قورەیزە چاویان بەیەك کەوت و شەڕیان کرد. فەرماندەی ئەوس، حوزەیر کەتاییب کوڕی سیماك باوکی ئوسەید کوڕی حوزەیر و فەرماندەی خەزرەج، عەمرۆ کوڕی نەعمانی بەیازی. عەبدالله کوڕی ئەبی سەلول لەگەڵ شوێن کەوتوانی خۆی لەشاردا مایەوە. منداڵەکانی حارسە کوڕی حارس لەئەوسییەکانیش مانەوە. کاتێك روبەروی یەك بوونەوە،

چاویان بەیەك كەوت و بەسەختی شەڕیان كرد و خۆڕاگرییان كردە پیشە.

ئەوسییەكان تامی تاڵی شەڕیان چێشت و بەراكردن رویان لەعەریز كرد. كاتێك حوزەیر هەڵاتنی ئەوانی بینی، هاوشێوەی وشتر خەوت و بەرم لەقاچی خۆیدا و هاواری كرد: هاوار لەسەر بڕان وەك سەر بڕانی وشتر! سوێند بەخوا ئاوڕ نادەمەوە تا بكوژرێم، ئەی ئەوسییەكان ئەگەر دەتانەوێت من بەدوژمن بسپێرن ئەو كارە بكەن. ئەوسییەكان پەیوەستی بوون. دو كوڕ لەمناڵەكانی عەبد ئەشهەل بەناوی مەحمود و یەزید لەپاڵ ئەو دەستیان بەشەڕ كرد تا كەوتنە سەر خاك. دواتر تیرێك كەهاوێژەرەكەی نەزانرا، لەئاسمانەوە هات و لەسینەی عەمرۆ كوڕی نەعمان فەرماندەی خەزرەجییەكان چەقی و كوشتی. لەم كاتەدا عەبدالله كوڕی ئەبی سەلول بە واری بە دەوری گۆڕەپانی بەعاس دەسوڕایەوە و هەواڵەكانی دەبیست. لەناكاو بینی جەستەی عەمرۆ كوڕی نەعمانیان لەعابایەكەوە پێچاوە و چوار پیاو لەسەر شان بەرەو گۆڕی دەبەن. بەو شێوەی لێهات كەپێش بینی كردبوو. عەبدالله وتی: تامی بێدادگەری بچێژە! خەزرەجییەكان شكستیان خوارد و ئەوسییەكان شمشێریان لەناو ئەواندا سوڕاند. جارچییەك جاریدا: ئەوی ئەوسییەكان، باش بڕوانن و واز لەبراكوژی بێنن كەهاوسێیەتی ئەوان بۆ ئێوە باشتر لەهاوسێیەتی روبهان (سەعالبەكان). ئەوسییەكان دەستیان هەڵگرت و تاڵانیان نەكردن. مناڵەكانی نەزیر و مناڵەكانی قورەیزە دەستیان بەتالان كردن كرد. ئەوسییەكان حوزەیری برینداریان هەڵگرت و بردیان. ئەو مرد. ئەوسییەكان ماڵ و بێستان و دارخواماكانی خەزەرجییان ئاگر تێبەردا. لەم كاتەدا سەعد كوڕی مەعازی ئەسهەلی، سامانەكان و ماڵەكانی مناڵەكانی سەلەی لەبەرابەر كارێك كە لەمێرگەجارەكەدا كردبوویان، خستە پەنای خۆی. پێشتر ئاماژەمان بەم داستانەدا. لەم رۆژەدا زوبەیر كوڕی ئەیسا كوڕی باتا، سابت كوڕی قەیس كوڕی شەماسی خەزرەجی رزگار كرد. ئەوی گرت و قژی ناوچاوی بڕی و ئازادی كرد. ئەمە یەكەم بەخشین بوو كە سابت كوڕی قەیس لەرۆژگاری ئیسلامی لەشەڕی مناڵەكانی قورەیزە پاداشتی پێدا. ئاماژەی پێدەدەین.

شەڕی بەعاس لەدوایین شەڕە ناودارەكان لەنێوان ئەوس و خەزرەج بوو. دواتر ئیسلام هات و قسەی خەڵك بووبە یەك و هەردوو دەستە بۆ هاوكاری ئیسلام و

شوێنکەوتوانی هاوپەیمان بوون و خواوەند قورسایی شەڕی لەسەر شانی خواپەرستان هەلگرت.

ئەنسار شێعری زۆریان سەبارەت بە بەعاس هۆنییەوە. لەناو ئەوان وتاری قەیس کوڕی خەتیمی زەفەری ئەوسی بوو:

| | |
|---|---|
| اتعرف رسما كالطراز المذهب | لعمرة ركبا غير موقف راكب |
| ديار التى كانت و نحن على منى | تحل بنالولارجاء الركائب |
| تبدت لنا كالشمس تحت غمامة | بدا حاجب منها و ضنت بحاجب |

لەم قەسیدەیە:

| | |
|---|---|
| و كنت امرأ لا ابعث الحرب ظالما | فلما ابووا اشعلتها كل جانب |
| اذنت بدفع الحرب حتى رأيتها | عن الدفع لا تزداد غير تقارب |
| فلما رأيت الحرب حربا تجردت | لبست مع البردين ثوب المحارب |
| مضعفة يغشى الا نامل ريعها | كان قتيريها عيون الجنادب |
| ترى قصد المران تلقى كانها | تذرع خرصان بايدى الشواطب |
| و سا محنى ملكاهنين و مالك | و ثعلبة الاخيار رهط القباقب |
| رجال متى يدعوا الى الحرب يسرعوا | كمشى الجمال المشعلات المصاعب |
| اذا ما فررنا كان اسوا فرارنا | صدود الخدود و ازورار المناكب |
| صدود الخدود و القنامتشا جر | و لا تبرح الاقدام عند التضارب |
| ظارناكم بالبيض حتى لانتم | اذل من السقبان بين الحلائب |
| يجردن بيضا كل يوم كريهة | و يرجعن حمرا جارحات المضارب |
| لقيتكم يوم الحدائق حاسرا | كان يدى بالسيف مخراق لاعب |
| و يوم بعاث اسلمتنا سيوفنا | الى حسب فى جذم غسان ثاقب |
| قتلناكم يوم الفجار و قبلة | و يوم بعاث كان يوم التغالب |
| اتت عصب للاوس تخطر بالقنا | كمشى الاسود فى رشاش الاهاضب |

واتاکەی: ئایا پاشماوەیەك لەماڵی دڵدار لەسەر نگاری جلێکی بەزێرچنراو دەبینی؟ بەکاروانێکەوە بۆ عەمرە رۆشت بەلام لەشوێنی سوارەکان درەنگی کرد. سەرزەمینەکانی ئەو دولبەری لەمەنا (مەنی) لەگەڵ ئێمەدابوو و ئەگەر هیوای

بەچوارپێ سوارییەکان نەدەبرد، لەگەڵ ئێمە دەمایەوە. ئەو وەك هەتاوێك کە لەژێر هەورێك بێتەدەر، لەبەرابەر ئێمە دەرکەوت، برۆیەکی لەسەر ئەو چاو ئاسك ئاسایانە دەرخست و لەنیشان دانی برۆکەیتری درێغی کرد. پیاوێك بووم هیچ کات شەڕێکی بێدادگەرانەم هەڵنەدەگیرساند بەڵام چوونکە هاوشێوەی ئەمان جگە لەشەڕ بەهیچ رازی نەبوون، لەهەموو شوێنێك هەڵم گیرساند. ئاگادارم کردنەوە کەشەڕ مەکەن و خۆتانی لێ دوورخەنەوە بەڵام بینیم خۆ دوورخستنەوە تەنیا دەبێتە هۆی نزیك بوونەوە. کاتێك بینیم شەڕ بەسەختی دەستی پێکردووە، لەسەر دوو کراسەکەی خۆم جلی شەڕم لەبەر کرد، زرێیەکی دو توێ کەقۆلەکانی پەنجەی دادەپۆشی، لەبەر کرد. دەتوت سەر مێخەکانی چاوەکانی (جەندەبن) (جۆرێك کولەیە). دەسکی ڕمەکان هاوشێوەی دارە ئاسن کوتراوەکان دەبینی کە لەدەست ژنانی چەرم خۆشکەردا بێت. هەنین و مالك و سەعلەبە کە لەدەستەی خەڵکانی پرسە ئافرێنن، سامانیان بەمن بەخشی. کاتێك هەڵبێین، خراپترین هەڵاتنمان ئەوە بێت رووگرژ بکەین و دووبارە شان بسورێنین و روو لەگۆڕەپان بکەین. رووگرژ کردنی روخسار، هاورێیە لەگەڵ ڕم وەشاندن و لەکاتی وەشاندنی شمشێر و ڕم هەنگاوەکان ئالەرزێت. بە شمشێرە تیژ و سپییەکان هێرشمان کردە سەر ئێوە و وامان نیشاندا مەبەستی چاکەمان لەگەڵ ئێوەدا هەیە، ئێوە بەشێوەیەك دەستەمۆ بوون کە لەبەچکە وشتر نێرەکان لەناو وشترە شیردەرەکان ریسواتر بوون. لەرۆژەکانی دژواری شەڕ، شمشێرەکانمان بەسپییەتی لەکاڵان دەرهێنا و سور لەخوێنی بوێرانی شەڕکەر کردمانە ناو کاڵان. ئێوەم لەشەڕی (حدائق) بێستانەکان بەسەر روت بینی و دەتوت دەستی من و شمشێرەکەم، لەدەسرێکی گەمەکردن دەچوو. لە شەڕی بەعاس شمشێرەکانمان ئێمەیان بەنەژاد و ریشەی قووڵ لەغەسان پەیوەست کرد. لەشەڕی فەجار و پێش لەوە ئێوەمان کوشتار کرد و رۆژی بەعاس رۆژی سەرکەوتنی ئێمە بوو. دەستە شەڕەکەرەکان لەئەوس دابەزین،، مەکانیان دەسوراند و بەشێوەیەك بەرێگادا دەڕۆشتن کەشێرانی دارستان لەژێر بارانە چڕەکان لەسەر تەپۆڵکەکان بەرێگادا دەڕۆن.

عەبدالله کوڕی ڕەواحە بەمشێوە وەڵامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| اشاقتك ليلى فى الخليط المجانب | نعم فرشاش الدمع فى الصدر غالب |
| بكى اثر من شطت نواه و لم يقم | لحاجة مخزون شكا الحب ناصب |
| لدن غدوة حتى اذا الشمس عارضت | اراحت له من لبه كل غارب |
| نحامى على احسابنا بتلادنا | لمفتقر او سائل الحث واجب |
| و اعمى هدته للسبيل سيوفنا | و خصم اقمنا بعد مائج ثاعب |
| و معترك ضنك يرى الموت وسطه | مشينا له مشى الجمال المصاعب |
| برجل ترى الماذى فوق جلودهم | و بيضا نقيا مثل لون الكواكب |
| وهم حسر لا فى الدروع تخالهم | اسودا متى تنشا الرماح تضارب |
| معاقلهم فى كل يوم كريهة | معى الصدق منسوب السيوف القواضب |

واتاکەی: لەیلی تۆی بەروخسارێکی ناوێتە بەسوری و سپییتی کەخۆی دەپاراست، هێنایە سەر زەوق، بەڵێ بارانی فرمێسك لەسوتانی دڵ سەرچاوە دەگرێت و دەبارێت. چاو بەدوای کەسێك گریا کەماڵەکەی دوور کەوتەوە و ئەو نیازی دڵدادەیەکی شەیدای کە لەعەشقدا دەسوتا، بەراوەردە نەکرد. لەکاتی بەرەبەیان تا ئەو کاتەی خۆر ئاوا بوو، هەر ئاوابووێك بۆ ئاوزی ئەو داخی خوارد و بۆی گریا ( رۆژێك کەئەستێرەکان دیار نین، بۆی گریان). ئێمە لەنەژادەکانی خۆمان بەسامانە پێشینەکان پاسەوانی دەکەین، بەنیازمەندی دەبەخشین یا بەشیاوێکی پێویستی دەدەین. چەند زۆرن ئەو کوێرانەی شمشێرەکانی ئێمە ئەوانی هێنایە سەر ڕێگای ڕاست و چەند زۆرن ئەو دوژمنانەی خوێنیان دەهێنایەوە و ئێمە ئەوانمان هێنایە سەرپێ. گۆڕەپانی ئەو شەڕانەی لەهەموو شوێنێکیەوە مەرگ دەباری و ئێمە هاوشێوەی وشترە کۆشا و نەترسەکان رومان تێدەکرد. بەهەنگاوە بەهێزەکان بەشێوەیەك زرێ بڵندەکانمان لەسەر پێستی خۆمان دەبینی و شمشێری سپیمان لەدەستابوو کە لەپاکی و ڕۆشنی لەئەستێرەکان دەچون. بەشێوەیەك دەچینە گۆڕەپان کەئێمە بەروت بزانن و گومان بکەن زرێمان لەبەردا نییە. ئەو شێرانەین هەرکات ڕمەکان بسوڕێنن، شەڕ لەگەڵ دوژمن دەست پێدەکەین. هێلانەکانمان لەهەر

ڕۆژێکدا گۆڕەپانی شەڕە، ڕاست کردار، خوازیاری ڕاستی، ڕازاوە بەشمشێرە تیژەکان.

ئەمە قەسیدەیەکی درێژە. لەیلی، کەعەبدالله کوڕی ڕەواحە بەناوی ئەوەوە خۆشەویستی کردووە، خوشکی قەیس کوڕی خەتیمە. عەمرە کە کوڕی خەتیم خۆشەویستی پێوە کردووە، خوشکی عەبدالله کوڕی ڕەواحەیە و ئەم ژنە دایکی نەعمان کوڕی بەشیری ئەنسارییە.

## زاڵبوونی سەقیف بەسەر تایف
## و شەڕی نێوان ئەحلاف و مناڵەکانی مالك

سەرزەمینی تایف لەکۆنەوە سەرزەمینی عەدەوان کوڕی عەمرۆ کوڕی قەیس کوڕی عەیلان کوڕی موزێر بوو. ئەو کاتەی ژمارەی خەڵکانی مناڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە کوڕی معاویە کوڕی بەکر کوڕی هەوازین کوڕی مەنسور کوڕی عێکرمە کوڕی خەسفە کوڕی قەیس کوڕی عەیلان زیادی کرد و ئەمان بەسەر تایفدا زاڵبوون، دوای شەڕێکی قورس ئەم سەرزەمینەیان لەدەست ئەوان دەرهێنا. مناڵەکانی عامر هاوینیان لەتایف بەسەر دەبرد و زستان لەسەرزەمینی خۆیان نەجد. شوێنی نیشتەجێ بوونی سەقیفییەکان لەدەوروبەری تایف بوو. خەڵك سەبارەت بەوان بەجیاوازی قسەیان کردووە. دەستەیەك بەئەیادیەکانیان دەزان و وتویانە ناوی سەقیف بەمشێوە بوو: قەیس کوڕی نەبت کوڕی مونبە کوڕی مەنسور کوڕی یەقدم کوڕی ئەفسی کوڕی دوعمی کوڕی ئەیدا لەرەچەڵەکی مەعد. دەستەیەك ئەوانیان بەهەوازین زانیوە و وتویانە ناو و نیشانی ئەوان بەمشێوەیە: قەیس کوڕی مونبە کوڕی بەکر کوڕی هەوازین کوڕی مەنسور کوڕی عێکرمە کوڕی خەسفە کوڕی قەیس کوڕی عەیلان. سەقیفییەکان ئەم سەرزەمینەیان بینی و گژ و گیا و میوە پاکەکانی سەرنجی ئەوانی ڕاکێشا. ئەوان بەعامرییەکانیان وت: ئەم سەرزەمینە بۆ کشت و کاڵ نابێت بەڵکو بۆ ئاژەڵداری باشترە. پێشنیارتان پێدەکەین ئاژەڵداری بکەنە پیشە. ئێمە خەڵکانێکین ئاژەڵمان نییە. پێشنیار بەنێوە دەکەین ئاژەڵداری و کشتوکاڵتان پێکەوە هەبێت بێ ئەوەی هەزینەیەك بدەن. زەمینەکانی

خۆتان بەئێمە بسپێرن تا بیانکێڵین و داری تیا بڕوێنین و چاڵی ناو هەڵکەنین و هیچ خەرجییەك نەخەینە ئەستۆی ئێوە. کاتێك کاتی کۆکردنەوەی بەرهەم بگات و میوە بەر بێت، نیوەی تەواوی بۆ ئێوە و نیوەی بۆ ئێمە کەکارمان تیا کردووە. مناڵەکانی عامر ئەم پێشنیارەیان پەسەند کرد و پێی رازی بوون و زەمینەکانیان بەوان سپارد. سەقیفییەکان لەتایف مانەوە و لەناو خۆیاندا دابەشیان کرد و زەویان کێلا و کشت و کاڵیان تیا کرد و ترێ و میوەکانی دیکەیان بەرهەم هێنا و بۆ رۆژگارێك ئەوەی بەڵێنیان بەمناڵەکانی عامر دابوو، جێبەجێیان دەکرد. لەبەرابەر ئەم کارە عامرییەکان لەمناڵەکانی سەقیف لەبەرابەر هێرش و تالآنی عەرەبەکان پاسەوانیان دەکرد. کاتێك سەقیفییەکان زۆربوون و بەهێز، سەرزەمینەکانی خۆیان بەهێز کرد و دیوارێکیان بەدەوری تایفدا کێشا و قەلآی بەهێزیان تیا دروست کرد و ئەوەی بەعامرییەکانیان دەدا (نیوەی بەرهەم و میوەکان) لەوانیان گرتەوە و نەیاندا. مناڵەکانی عامر ویستیان لەوانی وەربگرن بەلآم نەیانتوانی و کاتێك شەڕیان کرد نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنن. سەقیفییەکان دوو بنەماڵەیان هەبوو: ئەحلاف و مناڵەکانی مالك. ئەحلاف لەم کارە پشکێکی گەورەیان بوو. چوارپێکانیان فراوان بوون. ئەوان یەکێك لەزەمینەکانی مناڵەکانی نەسر کوڕی معاویە کوڕی بەکر کوڕی هەوازین کەپێیان دەوت (جلزان)، کردە شوێنی پاسەوانی کردن بۆ خۆیان. مناڵەکانی نەسر لەم کارە توڕە بوون و لەسەر ئەو زەمینە شەڕیان لەگەڵ کردن و شەڕەکەیان قوڵ بوویەوە. سەرکردەی مناڵەکانی نەسر، عوفەیف کوڕی عەوف کوڕی عوبادی نەسری یەربوعی و سەرکردەی ئەحلاف، مەسعود کوڕی قەعنەب. کاتێك شەڕ لەنێوان مناڵەکانی نەسر و ئەحلاف درێژەی کێشا، مناڵەکانی مالك و سەرکردەکەیان جەندەب کوڕی عەوف کوڕی حەرەس کوڕی مالك کوڕی حوتەیت کوڕی جەشم لەسەقیفیەکان (بەهۆی ئەو ڕقە کۆنانەی لەگەڵ ئەحلاف بوویان) ئەم دەرفەتەیان بەهەڵ زانی و لەگەڵ یەربوعییەکان لەبەرابەر ئەحلاف بوونە هاوپەیمان. کاتێك ئەحلاف ئەمەیان بیست هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە. یەکەم شەڕ لەنێوان ئەحلاف و مناڵەکانی مالك و هاوپەیمانەکانی لەمناڵەکانی نەسر ( لەرۆژی تایف ) رویدا. شەڕێکی سەختیان کرد ونەحلاف سەرکەوتن و ئەوانیان بۆ دۆڵێك

لەولای تایف بەناوی (لحب) دورخستەوە. ژمارەیەکی زۆر لەمناڵەکانی مالك و مناڵەکانی یەربوع کوژران. ئەم جەنگە لەدۆڵێکی ئەو کێوەدا روویدا کەپێیان دەوت (ئەبان). دواتر چەند جارێك شەڕیان کرد کەهەر شەڕە و ناوی خۆی پێبڕا: شەڕی ( غەمر زی کێندە) لەلای نەخلە و شەڕی (کرونا) لەلای حیلوان. عوفەیف کوڕی عەوف یەربوعی بەشێوەیەك قیژاندی کە بەگومانی عەرەبەکان، هەفتا ژنی سکپڕ لەتاوا مناڵەکانیان فڕێدا. ئەوان سەختترین شەڕەکانیان دژی یەك خستەگەڕ و دواتر بلأوەیان لێکرد. مناڵەکانی مالك ویستیان ببنە هاوپەیمانی دوس و خەسعەم و هاوشێوەکانی ئەمانە تا لەبەرابەر ئەحلاف شەڕ بکەن. ئەحلاف ڕۆشتنە مەدینە و داوای هاوپەیمانیان لەئەنسار لەبەرابەر مناڵەکانی مالك کرد. مەسعود کوڕی موعتەب ڕۆشتە لای ئۆحەیحە کوڕی جولاح یەکێك لەپیاوانی عەمرۆ کوڕی عەوف لە مەوس (کە لەگەورەکانی ئەنسار لەزەمانی خۆیدا بوو) و داوای هاوپەیمانی لێکرد. ئۆحەیحە وتی: سوێند بەخوا هەر پیاوێك کە لەناو خەڵکەکەی خۆی بێتەدەر و خوازیاری هاوپەیمانی خەڵکانیتر بێت، بۆ بەرژەوەندی ئەوان شتێکی خراپتر لەوە دەگرێتە ئەستۆ کەلێی هەڵاتووە و بۆ چارە کردنی بەدوای هاوپەیماندا دەگەڕێت. مەسعود پێی وت: من برای تۆم( ئەوان پێکەوە هاورێ بوون). ئۆحەیحە وتی: برای تۆ ئەو کەسەیە لەپشت سەرت بەجێت هێشت. بۆ لای بگەڕێرەوە و ئاشتی لەگەڵدا بکە هەرچەند بەبەهای بڕینی لوت و گوێچکەت بێت. ئەگەر لەگەڵ ئەودا ناسازگار بیت، کەس چاکە لەگەڵ تۆ ناکات. مەسعود لای ئۆحەیحە هەستا و ئۆحەیحە ساز وبەرگ و توێشو و کەرەستەی شەڕی پێدا و کۆیلەیەکی پێبەخشی کە لەمەدینە قەڵای دروست دەکرد و دیوارەکانی بەرز دەکردەوە. ئەو بۆ مەسعود کوڕی موعەتەب چەندین قەڵای دروست کرد کە لەیەکەمین قەڵاکانی تایف بوون و دوای ئەوە بوو قەڵاکان لەتایف سەریان بەرز کردەوە. دوای ئەوە شەڕێکی شیاوی باس لەناو ئەوان روی نەدا. ئەوان سەبارەت بەشەڕەکانی خۆیان شیعری زۆریان وت. لەوان وتەکانی (موخەبیر) یانی هەمان رەبیعە کوڕی سوفیان یەکێك لەپیاوەکانی عەوف کوڕی عوقەدە لەئەحلافە کەدەڵێت:

و ما كنت ممن ارث الشر بينهم | و لكن مسعودا جناها و جندبا
قريعى سقيف انشبا الشر بينهم | فلم يك عنها منزع حين انشبا
عناقا ضروسا بين عوف و مالك | شديدا لظاها تترك الطفل اشيبا
مضرمة شبا اشبا و قودها | بايديهما ما اورياها و اثقبا
اصابت براء من طوايف مالك | و عوف بما جرا عليها و اجلبا
كجمثورة جاؤوا تحطوا مآبنا | اليهم و تدعو فى اللقاء معتبا
و تدعو بنى عوف بن عقدة فى الوغى | و تدعو علاجا و الحليف المطيبا
حبيبا و حيا من رباب كتائبا | و سعدا اذا الداعى الى الموت ثوبا
و قوما بكروثاءشنت معتب | بغارتها فكان يوما عصبصبا
فاسقط احبال السناء بصوته | عفيف اذا نادى بنصر فطربا

واتاكەی: لەو کەسانە نەبووم شەڕ و هەرا لەناو ئەواندا هەڵگیرسێنم. مەسعود و جەندەب ئەم شەڕەیان لەناو ئەواندا هەڵگیرساند. دوو دورخراوەی قورەیش کەناگری شەڕیان لەناو ئەم خەڵکەدا داگیرساند و کاتێك ئاگر بڵێسەی سەند، کەس نەیتوانی خۆی لێ رزگار بکات. پێشهاتێکی سەخت و گران و زیانبار لەنێوان عەوف و مالك، ئاگرێکی بەبڵێسە کەهەر منال و پیرێك لەناو دەبات. ئەو دوانە زەوییان هەڵکۆڵی و شەڕیان بەرێخست و شیاوی ئەوە بوون گیانبازان بەخاك بسپێرن چوونکە لەسەرەتاوە، شەڕێکی سەخت و مەترسیداریان داگیرساند. عەوف و بەرا بەو بەلآیانەی بەسەر بنەماڵەکانی مالکیان هێنا، ئەوانیان جەرگ سوتاو کرد. وەك تۆپەڵێك خۆڵ بۆ شوێنی گەڕانەوەی ئێمە هاتن و هێرشیان کردە سەر ئەوان و موعتەب خەڵکی بۆ شەڕ هان دەدا. کوڕانی عەوف کوڕی عوقەدە، عیلاج و ئەو هاوپەیمانانەی بەگوڵاو دەستیان شۆردبوو، پیاوانیان بۆ کوشتاری یەکتر هان دەدا. حەبیب و چەندین بنەماڵە لەرەباب ك دەستە شەڕکەرەکانیان دروست کرد و سەعد لەو کاتەی جارچی مەرگ هاواری دەکرد، روی کردە ئەوێ. خەڵکانێك لەسەرزەمینی (مەکروسا) موعەتەب، بەهێرشەکانی خۆی هانیدان و رۆژێکی سەختی خولقاند. ئەوسا، کاتێك عوفەیف لەتوندی و سەختی شەڕ بێزار و بەدەنگی بەرز پیاوانی خۆی بۆ یارمەتیدان بانگ دەکرد، ژنە سکپڕەکان منداڵەکانیان فرێدا.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زامیر محەمەد رەشید

بەرگی سێیەم

چاپی دووەم

سلێمانی

٢٠١٢

## پێڕست

## گەڕانەوە بۆ سەربوردەی پێغەمبەر(د.خ)

عەبدولموتەلیب هەشت ساڵ دوای ساڵی فیل مرد و کوڕەکەی خۆی ئەبوتالبی ڕاسپارد بەباشترین شێوە ئاگای لەپێغەمبەر(د.خ) بێت. ئەبو تالیب ئەو کەسە بوو کارەکانی پێغەمبەر(د.خ) و سەرپەرەشتی کردنی ئەوی گرتە ئەستۆ (لێرەوە بو کوڕەکەی عەلی لەساڵە سەرەتاییەکانی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) ئاشنا بوو و تاکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ یەك ساتیش لەو دوورنەکەوتەوە). ئەمە دوای مردنی باوەگەورێی پێغەمبەر(د.خ) بوو. کاتێك ئەبوتالیب بەرەو شام بەرێکەوت و ئاهەنگی چونەدەرەوە لەشاری کرد، پێغەمبەر(د.خ) پەیوەستی بوو. ئەو خۆشەویستی بۆ ئەم منالە نازەنینە شکۆفەی کرد و لەگەڵ خۆیدا بردی. پێغەمبەر(د.خ) لەم کاتەدا نۆ ساڵی بوو. کاروان لەشاری بۆسرای شام دابەزی. پیاوێکی خۆپارێز بەناوی بۆحەیرا لەخانەقا تایبەتەکەی خۆی ژیانی بەسەر دەبرد، زانیاری لەسەر ئاینی مەسیحی بوو. بەردەوام لەو پەرەستگایە پیاوێکی خۆپارێز ژیانی بەسەر دەبرد کەزانیارییەکان بەو دەگەشت. نوسراوێکی لێ بوو کە لەناو ئەوان دەست بەدەست دەسوڕا. کاتێك بۆحەیرا ئەم کاروانەی بینی، خواردنێکی فراوانی بۆ ئامادە کردن وئەمە لەبەر ئەوە بو بینی لەناو هەموویان هەورێك بەسەر سەری پێغەمبەرەوەیە و سێبەری بۆ دەکات. کاروانییەکان هاتن و لەسێبەری دارێکدا حەسانەوە. ئەم دارە لەنزیك سەومعەکەی بۆحەیرا بوو. لقەکانی لەسەر سەری پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە بەشێوەیەك هەموو سێبەرەکە کەوتە سەر پێغەمبەر(د.خ) . پیاوی خۆپارێز لەماڵەکەی خۆی هاتەدەر و بانگیکردن. کاتێك پێغەمبەری بینی، بەسەر سورمانەوە سەیری کرد. یەك یەك لەئەندامەکانی ڕوانی بەشێوەیەك دەتوت پێشتر نیشانەکانی بینیوە و ئێستا بەراوەردیان دەکات.

کاتێك خەڵك لەخواردن دەستیان هەڵگرت و بڵاوەیان لێکرد، لەپێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەچەندین بابەت لەخەو و بێداری پرسیاری کرد و وەڵامەکەی لەگەڵ وەڵامە ڕاستەکانی خۆی بەیەك زانی. سەیری مۆری پێغەمبەری لەسەر دوشانی کرد. دواتر بەئەبوتالیبی مامی وت: ئەم کوڕە چی تۆیە؟ وتی: کوڕمە. خۆپارێز وتی: نابێت باوکی زیندوو بێت. ئەبوتالیب وتی: ڕاستییەکەی، کوڕی براکەمە و

کاتێك لەسکی دایکیدا بوو، باوکی مرد. خۆپارێز وتی: ئێستا راستت وت. هەر ئێستا بیگەڕێنەوە بۆ شارەکەی خۆت و لەبەرابەر جوولەکەکان پارێزگاری لێبکە و رێزی بگرە چوونکە سوێند بەخوا ئەگەر بیبینن و ئەونیشانانەی من بینیم، ئەوانیش هەستی پێبکەن، بێ گومان هەوڵ دەدەن زیانی پێ بگەیێنن لەبەر ئەوەی ئەم لاوە کارێکی قورسی لەئەستۆیە.

مامی هەڵگیرت و بۆمەککەی گەڕاندەوە.

دەستەیەك دەڵێن: لەوکاتەدا کەئەو بەمامەکەی وت دەبێت بیگەڕێنێتەوە بۆ مەککە چوونکە لەوانەیە رۆمییەکان ئازاری بدەن، لەناکاو حەوت پیاو لەرۆمییەکان گەشتن. بۆحەیرا بەوانی وت: بۆ هاتوونن بۆ ئێرە؟ وتیان: پێیان وتووین ئەم پێغەمبەرە(د.خ) لەم مانگەدا هاتۆتەدەر. خەڵکیان بۆ گەران بۆ هەموو رێگاکان ناردووە. هەنووکە ئێمەیان بۆ ئێرە ناردووە کەماڵەکەی تۆ لێرەیە. بۆحەیرا وتی: ئایا بەگومانی ئێوە ئەگەر خوا بیەوێت کارێك ئەنجام بدات، کەس دەتوانێت رێگری لێ بکات؟ وتیان: نا. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوان لای بۆحەیرا مانەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من تەنیا دوجار مەبەستی ئەو کارانەم کردووە کە خەڵك لەسەردەمی جاهلیدا دەیانکرد. لەهەردوو جارەکە خوا رێگەی لێگرتم. ئیتر هیچ کات مەبەستی ئەو کارانەم نەکرد تا خوا منی بۆ پێغەمبەری هەڵبژارد. جارێکیان لەشەوێکدا، بەکوڕێکم وت کەلەگەڵ من شوانی دەکرد و ئێمە لەسەر بەرزاییەکانی مەککە بووین: ئاگات لەمەڕەکانی منیش بێت تا برۆم بۆ مەککە و وەك گەنجەکانی ئەوێ سەرقاڵی رابواردنی شەوانە بم. وتی: ئەو کارە دەکەم. بەرێکەوتم و کاتێك گەشتمە نزیك مەککە، ئاوازی ژەنینی سازێکم بیست. وتم: چییە؟ وتیان: فلان پیاو، فلان ژنی وەك هاوسەر هەڵبژاردووە و شەوی زاوایەتی ئەو و شادمانی ئەوە. دانیشتم تا گوێ بگرم. خوا گوێی گران کردم، خەوێکی قورسم لێکەوت. کاتێك لەخەو هەستام کەهەتاوی سوتێنەر گازی لەجەستەم دەگرت. بۆ لای هاورێکەم گەڕامەوە. پرسیاری لێکردم و منیش هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. جارێکیتر هەمان قسەم بەو کوڕە وت و بەرەو مەککە بەرێکەوتم. ئەم جارەیش هەمان داستان بۆ من روویدایەوە. دوای ئەوە ئیتر هیچ کات مەبەستی کاری خراپم

نەکردووە.

## هاوسەرگیری پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ خەدیجە

پێغەمبەر(د.خ) کاتێك بیست و پێنج ساڵ تەمەنی بوو، خەدیجەی وەك هاوسەر هەڵبژارد و ئەم خاتوونە لەو کاتەدا چل ساڵە بوو.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبوو خەدیجە کچی خوەیلد کوڕی ئەسەد کوڕی عەبد ئەلعزی کوڕی قوسەی ژنێکی رێزدار و بازرگانێکی بەتوانا بوو کە بەسامانەکەی پیاوانی بەکرێ دەگرت و بەشێك لەداهاتەکەی لەرێگەی کڕین و فرۆش بەوان دەدا تا بازرگانی بۆ بکەن. قورەیشییەکان بازرگان بوون. کاتێك ناوبانگی راستگۆیی و راست کرداری و پاکی پێغەمبەر(د.خ) بەگوێی خەدیجە گەشت، کەسی ناردە لای ئەو وداوای کرد تا لەگەڵ سامانەکەی ئەو بۆ بازرگانی کردن برواتە شام و کرێیەکی زیاتر لەکەسانیتر وەربگرێت. خەدیجە کۆیلەکەی، مەیسەرەی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) نارد. پێغەمبەر(د.خ) رازیبوو و لەگەڵ مەیسەرە بەرەو شام بەرێکەوت. پێغەمبەر(د.خ) لەنزیکی سەومەعەی پیاوی خۆپارێز لەژێر دارێك حەوایەوە. پیاوی خۆپارێز لەماڵەکەی هاتەدەر و لەمەیسەرەی پرسی: ئەمە کێیە؟ وتی: پیاوێك لەقورەیش. پیاوی خۆپارێز وتی: لەژێر ئەم دارە جگە لە پێغەمبەر(د.خ) کەس ناخەوێت.

ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) کالاکانی خۆی فرۆشت و کالای تازەی شامی کڕی و رووی لەمەککە کرد. کاتێك رۆژ دەهات و هەوا گەرم دەبوو، مەیسەرە دوو فریشتەی دەبینی کەلە بەرەدەم خور بۆ پێغەمبەر(د.خ) سێبەریان دروست دەکرد و ئەو سوار لەسەر وشتر غاریدەدا. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەشتە مەککە، خەدیجە سودی زۆری دەسکەوت مەیسەرە داستانی خۆی لەگەڵ پیاوی خۆپارێزی بۆ خەدیجە گێرایەوە و پێی وت لەسەراسەری رێگا دوو فریشتە سێبەریان بۆ پێغەمبەر(د.خ) دروست دەکرد.

خەدیجە، خاتونێکی رێزدار، دوورئەندێش و بیرمەند بوو. جیاواز لەمە خوا دەیویست بەخۆشەویستی خۆی رێزی لێبگرێت. خەدیجە پێشنیاری

بەپێغەمبەر(د.خ) کرد وەك هاوسەر هەڵیبژێرێت. ئەو لەروانگەی گەورەیی و نەژاد و بنەماڵـە و سـامان، لەلەپێـشترین ژنـانی قـورەیش بـوو. هـەموو پیـاوانی قـورەیش ئارەزویـان دەکـرد ئەگـەر بتـوانن، دەسـتیان بـەو بگـات و وەك هاوسـەر هەڵیبـژێرن. کاتێك خەدیجە ئەم پەیامەی بەپێغەمبەر(د.خ) دا، ئەو لەگەڵ مامەکانی خۆی باسی کرد و هاوڕێ لەگەڵ حەمزە و ئەبوتالیب بەرێکەوت تا ڕۆشتنە لای خوەیلد باوکی خەدیجە و خوازبێنییان کرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی وەك هاوسەر هەڵبژارد و ئەم ژنـە هـەموو منداڵـەکانی ئـەو جگـە لـەئیبراهیمی هێنایـە دنیـا: زێنـەب، روقیـە، دایکـی کەلـسوم، فاتیمـە، قاسـم ( کـە پێغەمبـەر(د.خ) لـەناوی ئـەو نازنـاوی بـاوکی قـاسمی وەرگرت) عەبدوڵڵە، تاهیر و تەییب. عەبدوڵڵە و تەییب و تـاهیر لەسـەردەمی ئیسلام لـەدایك بـوون. کوڕەکـانی هـەموو مـردن بـەڵام کـچەکانی مانـەوە و باوەڕیـان هێنـا و بۆمەدینە کۆچیان کرد.

دەڵێن: کەسـێك کـە ئـەوی بەشـودا، مامەکـەی عـەمرۆ کـوڕی ئەسـەد بـوو، بـاوکی پێش شەڕی فەجار مرد. واقدی دەڵێـت: ئەمـە راسـتە چوونکە بـاوکی پێـش شـەڕی فەجار مرد.

مـاڵی خەدیجە لـەو کاتـەدا ئـەو ماڵـە بـوو کەئێستا بەناوی ئەو ناسراوە. دەڵێن: معاویە کوڕی ئەبوسوفیان کڕی و مزگـەوتی تیـا دروسـت کـرد تـا خـەڵك نوێـژی تیـا بخوێنن.

لەنێوان پێغەمبـەر(د.خ) و خەدیجـە ژنێـك بـەناوی نەفیـسە کـچی مونییـە خوشـکی یـەعلی کـوڕی مونییـە پـەیامی دەبـرد و پـەیکی خۆشـەویستی ئـەوان بـوو. ئـەم ژنـە لـەڕۆژی گـرتنی مەککـە لەلایـەن ئیـسلامەوە بـاوەڕی هێنـا و پێغەمبـەر(د.خ) ڕێـزی لێگرت و چاکەی لەگەڵدا کرد.

## پەیمانی فازلان

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: دەستەیەك لەخەڵكی جۆرهۆم و قەتورا بوون بەم ناوانە: فوزەیل كوڕی حارسی جۆرهەمی، فوزەیل كوڕی وەداعە قەتوری و موفەزەل كوڕی فەزالە جۆرهەمی، ئەوان كۆبونەوە و لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵ یەك ڕێككەوتن و پەیمانیان بەست كەلەشاری مەككە ڕووبەڕووی ستەمكاران ببنەوە و ئارامی بۆ هیچ بێدادگەرێك نەهێڵنەوە. وتیان: جگە لەمە شیاو نییە بۆ شاری مەككە چوونكە خوا پێگەی خۆی لێرەدا دروست كردووە. عەمرۆ كوڕی عەوف جۆرهەمی لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| ان الفضول تحالفوا و تعاقدوا | الا يقر ببطن طالم |
| امر عليه تعاهدوا و تواثقوا | فالجار و المعتر فيهم سالم |

واتاكەی: چاكەكاران ڕێككەوتن و بوونە هاوپەیمان تا ئارامی بۆ هیچ ستەمكارێك لەشاری مەككە نەهێڵنەوە. كارێك بوو پەیمانیان لەسەر بەست و پەیوەندی دۆستایەتییان بەهێز كرد و ئێستا هەژار و دراوسێ لەناو ئەوان ئاسوودە و ئارخەیانە.

دواتر ئەم پەیمانە لەناوچوو تەنیا بیرەوەرییەكەی بۆ قورەیشییەكان مایەوە.

هۆزەكانی قوەریش داوای هاوپەیمانی و ڕێككەوتنیان لەگەڵ یەكتر كرد. ئەوان بۆ ئەم كارە ماڵی عەبدوڵڵە كوڕی جودعانیان هەڵبژارد كەپیاوێكی ڕێزدار و بەتەمەن بوو. ئەم كەسانە گەورەی هۆزەكان بوون: مناڵەكانی هاشم، مناڵەكانی عەبدولموتەلیب، مناڵەكانی ئەسەد كوڕی عەبدولعزی، مناڵەكانی زۆهرە كوڕی كلاب و مناڵەكانی تیم كوڕی موڕە. لەگەڵ یەك پەیمانیان بەست كە لەشاری مەككە هەر ستەملێكراوێك لە خەڵكی ئەوێ، یا خەڵكیتر ببینن، پشتی دەگرن و لەبەرابەر ئەو ستەمەی لێكراوە، بەرگری لێدەكەن تا مەبەستەكەی بێتەدی و دادی وەربگیرێت. قورەیشییەكان ئەم پەیمانەیان بەپەیمانی فازلان ناوبرد و

پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی بەستنی پەیمانەکە ئامادە بوو. دواتر کاتێك خوا ئەوی وەك پێغەمبەر هەڵبژارد، فەرمووی: لەگەڵ مامەکانم شایەتی بەستنی پەیمانێك لەماڵی عەبدوڵڵە کوڕی جودعان بووم کە بەهەموو وشترە مووسوورەکانی ناگۆڕمەوە. ئەگەر لەرۆژگاری ئیسلامی منیان بۆ پەیمانێکی لەو شێوە بانگێشت دەکرد، رازی دەبووم.

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حارسی تیمی وتی: لەنێوان حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبو سوفیان لەسەر داوایەك، کێشە دروست بوو و لەم کاتەدا وەلید لەلایەن مامەکەی خۆی معاویە کوڕی ئەبو سوفیان فەرمانداری مەدینە بوو. وەلید بەپشت بەستن بەهێزی فەرمانڕەوایەتی، ستەمی دەکرد. حسەین کوڕی عەلی پێی وت: سوێند بەخوا یا داواکەی من جێبەجێ دەکەیت و سامانەکەم بۆ دەگەڕێنیتەوە یا لەمزگەوتی پێغەمبەری خوا دەوەستم و شمشێر لەکالان دەردەکێشم و داوای بەستنی پەیمانی فازلان لەهەمووان دەکەم. عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر لەوێ بوو، وتی: بەخوا سوێند دەخۆم ئەگەر داوای ئەو پەیمانە لەمن بکات رازی دەبم تا بەخواستەکەی دەگات یا لەو رێگادا دەمرم. ئەم هەواڵە بەگوێی میسوەر کوڕی مەخرەمە گەیشت و ئەویش هەمان قسەی کرد. عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵەی تیمی بیستی و هەمان قسەی دوبارە کردەوە. کاتێك وەلید لەم کارە ئاگادار بویەوە، خواستەکەی حسەینی هێنایە دی و ئەوی لەخۆی رازی کرد.

## وێرانی و ئاوەدان کردنەوەی کەعبە لەسەر دەستی قورەیش

لەسی وپێنج ساڵی ژیانی پێغەمبەر(د.خ)، قورەیشییەکان کەعبەیان وێران کرد. هۆکاری وێران کردنەکە ئەوە بوو ماڵی کەعبە بەردچنێکی بەرزتر لەئەندامی پیاوێك بوو. ویستیان بەرزی بکەنەوە و سەربانێکی بۆ دروست بکەن چوونکە دەستەیەك لە قورەیشییەکان و کەسانیتر، دو ئاسکی زێڕینیان لەناو یەکێك لەچاڵەکانی کەعبە دزی.

داستانی ئەم دوو ئاسکە زێڕینە بەمشێوەیە: کاتێك خواوەند فەرمانی دروستکردنی کەعبەی بەئیبراهیم و ئیسماعیلیدا، ئەو کارەیان ئەنجامدا.( پێشتر ئاماژەمان پێدا). ئیسماعیل لەمەککە مایەوە و بووبە سەرپەرەشتی کەعبە و تا لەژیاندا بوو، وەك سەرپەرەشتی کەعبە. دوای ئەو کوڕەکەی نبت ئەم کارەی گرتە ئەستۆ. کاتێك نبت مرد و مناڵەکانی ئیسماعیل فراوان نەبوون، مناڵەکانی جۆرهەم بەسەر ئەواندا زاڵبون و سەرپەرەشتی ماڵی خوایان لێسەندن. یەکەم کەس لەوان کە بوو بەسەرپەرەشتی ماڵی خوا، موزاز بوو. دواتر مناڵەکانی ئەم کارەیان گرتە ئەستۆ تا ئەوەی جۆرهەمییەکان ستەمیان کرد و ڕێزی ماڵەکەیان خستە ژێر پێ تا ئەو ئەندازەی کەوترا: ئەساف و نایلە ژن وپیاوێك بوون لەناو کەعبەدا زینایان کرد و بونە بەرد.

هۆزی مناڵەکانی خوزاعە دوای بڵاوبونەوەی مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عامر لەیەمەن، لەتەهامە نیشتەجێ ببوون. خواوەند بارانێکی لافاوهێنەر و ماڵ وێرانەکەری بۆ داباراندن و ئەوانی تەفروتوونا کرد. لەم کاتەدا مناڵەکانی خوزاعە ڕێککەوتن تا پاشماوەکانی جۆرهەم لەو سەرزەمینە دەربکەن و دووریان بخەنەوە. شەڕ دەستی پێکرد وهەردوولا شەڕیان کرد. سەرکردەی خوزاعە لەم کاتەدا عەمرۆ کوڕی ڕەبیعە کوڕی حارسە بوو. کاتێك عامر کوڕی حارسی جۆرهەمی بینی، لەتێکشکان نزیك بۆتەوە، دوو ئاسکە زێڕینەکە و بەردی ڕەشی( الحجر الاسود) هەڵگرت و ڕوویکردە دەرگای خواوەند و بۆ لای ئەو گەڕایەوە و داوای لێخۆشبونی

کرد، بەردەوام دەیوت:

لاهم ان جرهما عبادك      الناس طرف و هم تلادك

بهم قديما عمرت بلادك

واتاکەی: خواوەندا، جۆرهەمیەکان بەندەکانی تۆن. خەڵکان کاڵا دەگمەنەکانی تۆن و جۆرهەمیەکان کاڵا کۆنە گرانبایییەکانی تۆ. لەسەردەستی ئەوان بوو لەکۆنەوە ولاَتەکانی تۆ ئاوەدان بونەوە.

تۆبەکەی لای خوا وەرنەگیرا ( و ئەو شکەستی خوارد). لەبەر ئەمە دو ئاسکە زێڕینەکەی لەناو کەعبە لەچاڵی زمزمدا شاردەوە وبە خاك و خۆڵ دایپۆشی. لەم کاتەدا لافاو هات وئەوانی برد. عەمرۆ کوڕی حارس لەمبارەوە وتی:

كأن لم يكن بين الحجون الى الصفا      انيس و لم كسمر بمكة سامر

بلى نحن كنا اهلها فأبادنا      ضروف الليالى و الجدود العواثر

واتاکەی: دەڵێی هیچ کات لەنێوان حەجون تا سەلف هیچ کەسێك نەبووە و هیچ کەسێك لەمەککە شەونشینی نەکرد و شەوبەئاگا نەمایەوە. بەڵێ، ئێمە نیشتەجێبووەکانی بووین کەسوڕانی شەو و ڕۆژەکان و بەختە نالەبارەکان لەناویان بردین.

دوای ئەوە سەرپەرەستی ماڵی خوا( دوای جۆرهەمییەکان)، عەمرۆ کوڕی ڕەبیعە گرتییە ئەستۆ و بەوتەی هەندێ کەس، عەمرۆ کوڕی حارسی غەسانی بوو بەسەرەپەرەشتی کەعبە. دواتر سەرپەرەشتی بەمناڵەکانی خوزاعە گەشت. جگە لەوەی هێشتا سێ کار و سێ پێگەی گرنگ لەناو هۆزەکانی موزێر مایەوە: یەکیان فەرماندان بەخەڵك کە لەحەجەوە ڕووبکەنە عەرەفە، ئەم کارە لەدەست غەوس کوڕی مورە کوڕی ئۆد دابوو. ئەو هەمان سوفەیە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. یەکیتر ڕەوانەکردنی خەڵکان لەمەنی بوو. ئەم کارە لەدەست مناڵەکانی زەید کوڕی عەدەوان بوو. سیانیتر دواخستنی مانگەن ناڕەواکان بوو ( بەمشێوە کاتێك شەڕێك بەناچاری گیرۆدەی دەکردن و ناچار دەبوون لەمانگە حەرام یا ناڕەواکان شەڕ

بکەن، مانگە ناڕەواکانیان دوادەخست و لەجیاتی ئەوە مانگێکیتریان بەناڕەوا دادەنا و لەسەراسەری ئەم ئایینە لەسەر شەڕنەکردن بەردەوام دەبوون). ئەم کارە لەدەست قەلەمس بوو کەهەمان حوزەیفە کوڕی فوقەیم کوڕی کەنانەیە. دوای ئەو بەمناڵەکانی گەشت و دوای ئەوان کەوتە دەست باوکی سەمامە کەهەمان جونادە کوڕی عەوف کوڕی قەلع کوڕی حوزەیفەیە.

دواتر خۆری ئیسلام هەڵهات و مانگە ناڕەواکان لەشوێنی خۆیاندا جێگر کران و خوا دواخستنیانی بەشتێکی فیرۆ ناوبرد.

دوای مناڵەکانی خوزاعە، قوڕەیشییەکان سەرپەرەشتی ماڵی خوایان گرتە دەست. ئەمەمان لەکاتی ئاماژەدان بەقوسەی کوڕی کەلاب باس کرد. ئەوسا، وەك ئامـاژەی پێدرا، عەبدولموتەلیب چاڵی زمزمی هەڵکەند و گەشتە قولایی و دوو ئاسکە زێرینەکەی دۆزییەوە.

ئەو کەسەی دوو ئاسکەکەی لا دۆزرایەوە، پیاوێك بوو بەناوی دویك کۆیلەی مولەیح کوڕی خوزاعە. قورەیشییەکان دەستی ئەویان بڕی. لەناو ئەو کەسانەی لەم دزییەدا بەشدار بوون، عامر کوڕی حارس کوڕی نەوفل و باوکی هارب کوڕی عەزیز و ئەبولەهەب کوڕی عەبدولموتەلیب بوون.

لەم کاتەدا، دەریا، کەشتییەکی گەورەی بازرگانی رۆمیەکانی بۆ کەنارەکانی جەدە هێنا بوو ئەم کەشتیە شکابوو. خەڵك دار و تەختەکانی ئەم کەشتییەیان هەڵگرت و بۆ دروست کردنی سەربانی ماڵەکانی خۆیان ئامادەیان کرد. لەو رۆژانەدا مارێك لەچاڵی کەعبە کەهەموو رۆژێك پێشکەشییەکانی رۆژی پێشووتر بۆ کەعبەیان تێدەکرد، بینرا کەدەرۆشتە ژێر دیواری کەعبە و هەرکەس لێی نزیك بکەوتایە دەیبینی کەئەو سەر و کلکی لەزەوی دەکوتێت ولەپەیکەری خۆی ئاوازێك دروست دەکات و دەم دەکاتەوە. خەڵك لێی دەترسان. رۆژێك کەمارەکە لەسەر دیواری کەعبە بوو، لەناکاو مەلێك دابەزی و مارەکەی بە نگالٚ بەرز کردەوە و بۆ ئاسمان فڕی. قورەیشییەکان وتیان: هیوادارین خوای گەورە لەوەی دەیکەین رازی بێت.

ئەمە لەکاتێکدا بوو پێغەمبەر(د.خ) سی وپێنج سالٚ تەمەنی بوو (سالٚی ٦٠٥

زاییـنی). ئـەم کـارە پـانزە سـاڵ دوای فـەجاری یەکـەم ئەنجامـدرا (شـەڕی فـەجار لەساڵی ٥٩٠ زایینی ئەنجامدرا).

کاتێك ویـستیان کەعبـە وێـران بکـەن، بـاوکی وەهـب، عـەمرۆ کـوڕی عـایز کـوڕی عیمران هەستا و بەردێکی لەبینای کەعبە هەڵگرت. بەرد لەدەستی پڕی و گەڕایەوە شوێنی خۆی. وتی: ئەی قورەیشییەکان، لتەنیا با چاکەکاران لەدروست کردنی ئەم ماڵـەدا بەشـدار بـن و بێجگـە لەسـامانە پاکـەکانی بـۆ خـەرج مەکـەن و مـارەیی ژنـی روسـپی بـۆ خـەرج کردنـی بـەکار نەبـەن و زێـر و سـیمێك کـە لەرێگـەی سـووخواردن بەدەسـتتان هێنـاوە، یـا شـتێك کەبـەزۆر لەکەسـێکتان وەرگرتـووە، مەخەنـە نـاو ئـەم کارەوە.

دەستەیەك دەڵێن: وەلید کوڕی موغەیرە بو ئەم قسانەی کرد.

دووبارە لێرەدا خەڵك لەوێرانکردنی کەعبـە ترسـان. وەلیـد کـوڕی موغـەیرە وتـی: من ئەم کارە بۆ ئێـوە دەسـت پێدەکـەم. ئـەو پاچـی هـەڵگرت و بەشـێکی وێـران کـرد. خەڵکان وتیان: ئەمشەو چاوەڕێ دەکـەین. ئەگـەر زیـانی پێگـەیشت، دەسـت لـەهیچ شتێك نادەین. ئەو شەوی کردە بەیانی و تەندروست بۆ سـەر کارەکـەی گەڕایـەوە. ئەو دەستی بەوێرانکردن کرد و خەڵك لەگەڵ ئەو بیناکەیان وێران دەکرد تا گەشتنە سـتوونەکان. پیاوێـك لـەقورەیش نـوێڵێکی خـستە نـاو دوو بـەردەوە تـا یـەکیان هەڵکەنێت. کاتێك بەردەکە جولا، هەموو مەککە لەرییەوە ( و خـەڵك ناچار خۆیان کێـشایە دواوە و سـتوونەکە دووبـارە جێگـەی خـۆی گرتـەوە). دواتـر بـۆ دروسـت کردنی بیناکە بەردیان کۆکردەوە و دروستیان کرد تا گەشتنە شوێنی روکن.

هـەر هۆزێـك دەیویـست بـەردە ڕەشـەکە هـەڵگرێت و لەشـوێنی خـۆی داینێـت. کێشەکە گەورە بوو تا ئەو رادەی خۆیان بۆشەڕ ئامادە کرد. منداڵـەکانی عەبدئەلـدار تـەغارێکی لێوانلێـو لـەخوێنیان هێنـا و لەگـەڵ منداڵـەکانی عـودەی لەسـەر مـەرگ پەیمانیان بەست و دواتر دەستیان کردە ناو خوێنکە و لەبەر ئەمە بەلێسەرەوەکان ناویـان دەرکـرد. لەسـەر ئـەم کـارە چـوار شـەو مانـەوە و دواتـر بـۆ راوێـژ کـردن کۆبوونـەوە. بـاوکی ئومەییە کوڕی موغـەیرە کـە بەتەمـەنترین پیـاوی قورەیش بـوو، وتـی: لـەنێوان خۆتـان داوەرێك دیـاری بکـەن، یەکـەم کـەس کـە لەمزگـەوت هاتـەدەر،

ببێتە داوەری ئێوە. یەکەم کەس کەهاتەدەر، پێغەمبەر(د.خ) بوو. کاتێك ئەویان بینی، لەشادمانیدا هاواریان کرد: ئەمە ئەو پیاوە پاکەیە، ئێمە فەرمانەکەی بەجێدێنین. کێشەکەیان بۆ محەممەد باس کرد. فەرمووی: پارچەیەك بێنن. پارچەکەیان هێنا. ئەو بەردە ڕەشەکەی هەڵگرت و خستییە ناوپارچەکە و وتی: نوێنەری هەر هۆزێك، سوچێکی پارچەکە هەڵدەگرێت و بەردەکە بەرز دەکاتەوە. ئەوان بەردەکەیان پێکەوە هەڵگرت و بەرزیان کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) بەدەستی خۆی بەردەکەی هەڵگرت و لەشوێنی خۆی داینا. دواتر بیناکە لەسەری دروست کرا.

## هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ پێغەمبەرایەتی

خواوەند لەبیستەم ساڵی پاشایەتی خوسرەوپەرویز کوڕی هورموز کوڕی ئەنەوشیروان (لەساڵی ٦١٠ زایینی) پێغەمبەری بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژارد. لەم کاتەدا، ئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی نوێنەری فەرمانداری ئێران بوو لەحیرە وفەرمانڕەوایەتی عەرەبەکانی دەکرد.

لەسەر گێرانەوەی حەمزە، عێکرەمە، ئەنس کوڕی مالك و عوروە کوڕی زوبەیر لە ەبدوڵلە کوڕی عەباس، پێغەمبەر(د.خ) لەچلٚ ساڵی بۆ گەیاندنی پەیام هەڵبژێردرا و وەحی بۆ هاتەخوار. لەگێڕانەوەیەکیتر، سەعید کوڕی موسەیب و عێکرەمە لەگێڕانەوەی عەبدوڵلە کوڕی عەباس ئاماژە بەوە دەدەن کەپێغەمبەر(د.خ) لەچل و سێ ساڵیدا بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا. بێ هیچ گفتوگۆیەك، هاتنە خوارەوەی وەحی لەرۆژی دوشەممەدا بوو. جیاوازی لەسەر ئەوەیە کام دووشەممەیە تیایدا وەحی هاتەخوار. باوکی قیلابە جەرمی دەڵێت: قورئان لەکاتێکدا بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاتەخوار کەهەژدە رۆژ لەرەمەزان تێپەڕیبوو. کەسانیتر دەڵێن: نۆزدەی رەمەزان بوو.

پێش ئەوەی جوبرەئیل بێتە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەو نیشانەی هاوشێوەی ئەو نیشانانەی دەبینی و دەیزانی کەخوا دەیەوێت بەخشینەکەی خۆی تایبەت بکات

بەو. وەك: قەڵشتنی سینەی لەلایەن دوو فریشتە، دەرهێنانی دڵی لەناو سینە و شۆردنی لەچڵك و دوژمنی. هەروەها ئەو لای هیچ بەرد و دارێك تێپەری نەدەکرد مەگەر ئەوەی دروودی بۆ دەنارد. سەیری راست و چەپی دەکرد و کەسی نەدەبینی. نەژادی جۆراوجۆر لەخەڵکان و شوێنکەوتووانی ئایینە جۆراوجۆرەکان، لەهەڵبژاردنی ئەو قسەیان دەکرد و زاناکانی هەر کام لەم نەتەوانە، ئەم داستانەیان بۆ خەڵکەکەی خۆیان دەگێرایەوە.

عامر کوڕی رەبیعە دەڵێت: لەزەید کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیلم بیست، دەیوت: ئێمە چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەر(د.خ) لەنەژادی ئیسماعیل لەبنەماڵەی مناڵەکانی عەبدولموتەلیب دەکەین بەڵام گومانم هەیە ببینم. یەکەم کەسم بەراستگۆی دادەنێم و شایەتی دەدەم ئەو پێغەمبەر(د.خ)ە. ئەگەر تەمەن رێگایی پێدایت و بینیت، لەمنەوە سلاوی لێبکە. ئێستا نیشانەکانیت پێ دەڵێم تا لەئێوە شاراوە نەبێت. وتم: بڵێ. وتی: پیاوێکە نەبەرز و نەکورت، نە مووی پڕە و نەتەنك، لەچاویدا جۆرە سوورییەك هەیە کەلێی جیانابێتەوە. مۆری پێغەمبەری لەنێوان دو شانییەتی، ناوی ئەحمەدە و ئەم شارە زادگا و شوێنی هەڵبژاردنی ئەوە بۆ پێغەمبەری. خەڵکەکەی ئەوەی ئەو باسی دەکات پەسەندی ناکەن و لەشارەکەیان دەری دەکەن. بۆ یەسرب کۆچ دەکات و لەوێ بانگەوازەکەی ئاشکرا دەبێت. ئاگاداربە نەکا هەڵخەڵەتێیت و پشتی تێکەیت چوونکە من لەهەموو ولاتەکاندا گەڕاوم و لێکۆڵینەوەم لەسەر ئایینی ئیبراهیم کردووە و هەرکەسم لەجوولەکە و یەهوودی و ئاگر پەرەست بینیبێت، پرسیارم لێکردووە و هەموویان وتوویانە: ئەم ئایینە دوای تۆدێت. هەموویان ئاماژەیان بەو نیشانانەدا کەبۆ تۆم باس کرد. هەموویان وتیان: جگە لەو پێغەمبەرێك نەماوە.

عامر دەڵێت: کاتێك باوەڕم هێنا، بۆ پێغەمبەرم گێرایەوە و سلاوی زەیدم پێ گەیاند. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سلاوی خوا لەو بێت، خوا لەو خۆش بێت. ئەوم لەبەهەشتا بینی.

جوبەیر کوڕی موتعیم دەڵێت: ئێمە لەبەرابەر بتێك بەناوی بوانە (سەوابە)

دانیشتبووین و ئەمە یەك مانگ پێش هاتنی وەحی بوو. مەڕ یا وشترێکمان سەربڕی. لەناکاو ئاوازدەرێك لەناو بتەکەوە هاواری کرد: گوێ لەم بابەتە سەرەنجراکێشە بگرن. چاوەڕوانی کردن بۆ وەحی تەواو بوو و هەنووکە بەردە ئاسمانییەکان بۆ ئێمە دەهاوێژرێن و ئەمە بۆ پێغەمبەریکی مەککی بەناوی ئەحمەدە کەبۆ یەسرب کۆچ دەکات. ئێمە بێدەنگ بووین و سەرمانسورما و ئەوەندەی نەخایاند، پێغەمبەر(د.خ) بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا.

گێڕانەوە سەبارەت بەنیشانەکانی پێغەمبەری فراوانە و زاناکان لەمبارەوە بابەتی زۆریان نوسیوە و هەموویان باسی سەرسوڕهێنەری بابەتەکەیان کردووە کەلێرەدا پێویست بەئاماژەدان ناکات.

## دەسپێکردنی وەحی بۆ پێغەمبەر(د.خ)

عایشە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: یەکەم شتێك پێغەمبەر(د.خ) لەوەحیدا بینی، خەونێکی راستین بوو کەهاوشێوەی شتێك وەك سپیەتی بەرەبەیان بوو. ئەو کات زیاتر تامەزرۆیی تەنیایی بوو. دەڕۆشتە ئەشکەوتی حەرا و بۆ چەند شەوێك بەپەرەستین و پاڕانەوە سەرقاڵ دەبوو و دواتر دەگەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی خۆی و بۆ چەندین شەو بەرابەر بەو شەوانە توێشوی هەڵدەگرت تا ئەوەی ئایینی راستی و دروستی لەناکاو بۆ ئەو دابەزی..

جبرەئیل لەبەرابەری دەرکەوت و وتی: ئەی محەممەد، تۆ نێردراوی خوایت. پێغەمبەری خوا وتی: لەوکاتەدا کەوتمە سەر ئەژنۆ و دواتر گەڕامەوە و پشتم بەردەوام دەلەرزا. ڕۆشتمە لای خەدیجە و وتم: دامپۆشن، دامپۆشن! ترسم ڕەوییەوە. دواتر هاتە لای من و وتی: ئەی محەممەد تۆ نێردراوی خوایت. دەڵێت: وام لێهات کەدەمویست خۆم لەبەرزایی چیاکە هەڵدەمەخوار. کاتێك ویستم ئەو کارە بکەم، هاتە لام و وتی: ئەی محەممەد من جبرەئیلم و تۆ نێردراوی خوایت. وتی: بخوێنە. وتم: خوێندن نازانم. دەڵێت: لەم کاتەدا منی گرت و منی سێ جار بەتوندی ڕاوەشاند، بەرادەیەك کەبێزار بووم. دواتر وتی: بخوێنە بەناوی خاوەند

کەجیهان و جیهانییەکانی ئافراند (عەلەق/١/٩٦). خوێندم. هاتمە لای خەدیجە و وتم: دەترسم، بەسەرهاتەکەم بۆ گێرایەوە. خەدیجە وتی: مژدانە، سوێند بەخوا، خوا هیچ کات تۆ لاواز ناکات چوونکە بەخوا تۆ ئەم پەیوەندییە بەهێز ڕادەگریت، بەردەوام راست دەڵێیت، ئەمانەت بۆ خواوەندەکانی دەگەڕێنیتەوە، بێ باوکان دەلاوێنیتەوە، یارمەتی هەژاران دەدەیت، باری قورس لەسەر شانی داماوەکان هەڵدەگریت، بەخۆشەویستییەوە میوانداری میوان دەکەیت و لەبەرابەر پێشهاتە گیانبڕەکان کەمەرگ دەیان ئافرێنێت، یارمەتی کەسانیتر دەدەیت. دواتر خەدیجە ڕۆشتە لای کورە پورەکەی وەرقە کوڕی نەوفل کەلە سەر ئایینی مەسیحی و شارەزای دەقەکانی تەورات و ئینجیل بوو. خەدیجە پێی وت: گوێ لەوتەکانی کوڕی براکەت بگرە. پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: چۆنییەتی بەسەرهاتەکەی لێ پرسیم و منیش بۆم گێرایەوە. وتی: ئەمە هەمان وەحییە کەبۆ موسا کوڕی عیمران هاتەخوار. خۆزگە تا ئەو کاتەی خەڵکەکەت تۆ لەم شارە دەردەکەن، زیندووبم. وتم: ئایا دەرم دەکەن؟ وتی: بەڵێ، کەس پەیامی هاوشێوەی تۆی نەهێنا مەگەر ئەوەی دژی وەستانەوە. ئەگەر ڕۆژێك تۆ بەگرفتار ببینم، بەتەواوی هاوکاریت دەکەم.

دواتر یەکەم شت لەقورئان کەدوای ئەم ئایە بۆ ئەو دابەزی، ئەمە بوو: سوێند بەپێنوس و ئەوەی پێی دەنوسن (قەڵەم /١/٦٨) بەدوای ئەو ئایە ئەمانە هاتن: ئەی ئەو کەسەی جل و بەرگت لەخۆت ئالاندووە، هەستە و خەڵکان ئاگادار بکەرەوە (مدثر /٢/٧٤---١)، سوێند بەڕۆژی ڕووناك و سوێند بەشەوی ئارام و تاریك، نەخواکەت بەجێت دێڵێت و نەلێت تورە دەبێت، ئەوجیهان بۆ تۆ باشترە لەم جیهان، بەزەویی خواوەند ئەوەندەت پێ دەبەخشێت شادمان بیت، ئایا تۆی بەبێ باوك نەبینی و پەنایدای؟ ئایا ڕێگەت ون نەکرد و ڕێنوێنی کردیت؟ ئایا دارایی نانخۆرە زۆرەکانی نەبینی و دەوڵەمەندی کردن؟ هەنووکە، بێ باوك لەخۆت مەتارێنە و پرسیارکەر بێ وەلام مەهێڵە و بەخشینەکانی خوا بۆ تۆ بۆ خەڵك بگێرەوە (ضحی /١/٩٣---١٢).

دواتر خەدیجە سەبارەت بەوەی خواوەند پێغەمبەری پێ جێگیر و بەرێز کردووە، بە پێغەمبەری وت: ئەی کوڕە مام، ئایا لەهەمان سات، کەهاوڕێکەت (جبرەئیل)

دێتە لای تۆ، دەتوانی ئاگادارم بکەیتەوە؟ وتی: بەڵێ. دواتر جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ)، خەدیجەی ئاگادار کردەوە. خەدیجە وتی: هەستە و لەسەر رانی چەپی من دانیشە. پێغەمبەر(د.خ) هەستا و لەسەر رانی دانیشت. خەدیجە وتی: ئایا دەیبینیت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەڵێ. خەدیجە وتی: هەست و لەسەر رانی راستی من دانیشە. پێغەمبەر(د.خ) لەسەر رانی راستی دانیشت. خەدیجە پرسی: ئایا دەیبینیت؟ پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ. خەدیجە لەچکەکەی خۆی فرێدا و قژی دەرکەوت و پێغەمبەر(د.خ) لەداوێنیدا بوو. دواتر وتی ئایا دەیبینیت؟ پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نا. خەدیجە وتی: ئەی کوڕە مام، خۆڕاگر بە، سوێند بەخوا ئەو دێو نییە و فریشتەیە.

یەحیا کوڕی ئەبی کەسیر دەڵێت: لەباوکی سەلمەم پرسی: یەکەم بەش لەقورئان کەهاتە خوار کامە بوو؟ وتی: ئەی ئەو کەسەی جل و بەرگت لەخۆت ئالأندووە ( مدپر ٧٤/١). وتم: کەسانیتر دەڵێن ئەمەیە: بخوێنە بەناوی خواکەت (قەلەم ٦٨/١). باوکی سەلمە وتی: من هیچ شتێك بۆ تۆ ناگێرمەوە مەگەر ئەو شتەی پێغەمبەر(د.خ) خۆی بۆی گێراوینەتەوە و وتی: من نیشتەجێی حەرابوم، کاتێك، کاتی مانەوە لەوێ بەسەرچوو، هاتمە خوار، ئاوازێکم بیست. سەیری لای راستی خۆمم کرد و هیچم نەبینی، سەیری لای چەپی خۆمم کرد و هیچم نەبینی، سەیری پێش و دواوەم کرد و هیچم نەبینی. سەرم بۆ ئاسمان بەرز کردەوە کەلەناکو بینیم ئەو، یانی فریشتە، لەسەر تەختێك دانیشتووە لەنێوان ئاسمان و زەمین (بەبڵندی زەوی تا ئاسمان). لێی ترسام و هاتمە لای خەدیجە وتم: دامپۆشە، دامپۆشە! و ئاو بەسەروچاومدا بکە. ئەو کارەی کرد. دواتر ئەم ئایە هاتە خوار. ئەی ئەو کەسەی جل وبەرگت لەخۆت ئالأندووە ( مدثر ٧٤/١). ئەم گێرانەوەیە راستە.

هوشام کوڕی کەلبی دەڵێت. یەکەم جار لەشەوی شەممە و یەك شەممەدا بوو جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) . دواتر خۆی نیشاندا و پەیامی خوای پێراگەیاند و دەستنوێژی پێگرت و فێری نوێژی کرد و ئەم سورەی پێ لەبەر کرد. بخوێنە بەناوی خواوەند کەجیهان و جیهانییانی ئافراند (عەلەق ٩٦/١). پێغەمبەر(د.خ) لەم کاتەدا تەمەنی چل ساڵ بوو.

زوهری دەڵێت: بۆ ماوەیەك وەحی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نەدەهات و ئەو بەتەواوی خەمبار بوو. بەردەوام دەڕۆشتە سەر بەرزایی چیاکان تا خۆی فڕێ بداتە خوار. کاتێك دەگەشتە سەر لوتکەی یەکێك لەچیاکان، جبرەئیل دەردەکەوت و پێی دەوت: بەراستی و دروستی تۆ پێغەمبەری خوایت. لەم کارە دەترسا و گیانی تازە دەبوویەوە. دواتر خواوەند فەرمانی بەپێغەمبەرەکەیدا خەڵکەکەی ئاگادار بکاتەوە کەبتەکانیان دەپەرستی نەك ئەو کەسەی ئەوانی ئافراندووە و ڕۆژی ئەوان دەدات، هەروەها فەرمانیدا بەخشینەکانی خوا بۆ خۆی یانی پێغەمبەر، لەگەڵ خەڵکدا باس بکات. ئەوەی کەبەخشین بەواتای پێغەمبەرییە، وتەی کوڕی ئیسحاقە. پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی بەنهێنی لەگەڵ کەس و ناسراوەکانی خۆی کەباوەڕی پێیان بوو، باس کرد. یەکەم کەس لەئافرێنراوانی خوا کەباوەڕی پێی کرد و بەراستگۆی زانی، خەدیجە کچی خویلدی هاوسەری بوو.

واقدی دەڵێت: هەموو هاوەڵانی ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەن یەکەم کەس کەوەڵامی بانگەوازەکەی پێغەمبەری دایەوە، خەدیجە بوو.

دواتر یەکەم شت دوای باوەڕهێنان بەتاقانەیی خوا و بێزار بوون لەبتەکان کەخوا لەناو فەرمانە ئیسلامیەکاندا پێویستی کرد، نوێژ بوو. کاتێك نوێژی لەسەر پێویست کرا، جبرەئیل ڕۆشتە لای، لەسەرەوەی مەککە بوو. بەباڵەکانی خۆی لەقەراغ دۆڵەکەیدا و کانییەکی لێ هەڵقولا. جبرەئیل دەستنوێژی گرت و پێغەمبەر(د.خ) سەیری دەکرد و جبرەئیل نیشانیدا خۆ پاککردنەوە بۆ نوێژ بە چ شێوەیێکە. دواتر پێغەمبەر(د.خ) وەك ئەو دەستنوێژی گرت. دواتر جبرەئیل هەستا و بوو بەپێشنوێژی و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەو نوێژی خوێند و گەڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) هاتە لای خەدیجە و فێری چۆنییەتی دەستنوێژ گرتنی کرد و خۆی پێش نوێژی بۆ کرد و خەدیجە لەپشت سەری ئەو، وەك ئەو نوێژی خوێند.

## میعراجی پێغەمبەر(د.خ )

خەڵك لەبارەی کاتی میعراج بەجیاوازی قسەیان کردووە. دەستەیەك دەڵێن: سێ ساڵ دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە بوو. دەستەیەك دەڵێن: یەك ساڵ دوای کۆچ بوو. هەروەها دژایەتییان هەیە لەسەر ئەوەی لەکوێدا شەوانە پێغەمبەریان ڕەوانە کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەمزگەوت لە(حجر) خەوتبوو کەشەوانە ڕەوانەیان کرد. دەستەیەك دەڵێن: لەماڵی دایکی هانی کچی ئەبوتالیب خەوتبوو. بێژەری ئەم وتەیە دەڵێت: بارەگای خوایی تەنیا مزگەوتە.

حەدیسی میعراج دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەبەڵگەی ڕاست گێراویانەتەوە.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) وتی: جبرەئیل و میکائیل هاتنە لای من و وتیان: سەبارەت بەکێ فەرمانیان بەئێمە داوە؟ وتیان: سەبارەت بەسەروەرەکەیان. دواتر ڕۆشتن و شەوێك دوای ئەو شەوە، سێ کەس هاتن و پێغەمبەر(د.خ) خەوتبوو. ئەویان لەسەر پشت خەواند و سینەیان هەڵدڕی و ئاوی زمزمیان هێنا و ئەوەی ناخۆشی و دوژمنی لەدڵیدا بوو، شۆردیان و دواتر تەشتێکیان پڕ لەباوەڕ و فرەزانی هێنا و دڵیان لەباوەڕ و فرەزانی لێوانلێو کرد. دەڵێت: جبرەئیل منی لەمزگەوت بردە دەر و بینیم چوارپێیەك لەوێدا وەستاوە کەهەمان (بوراقە). ئەم چوار پێیە لەکەر گەورەتر و لەئێستر بچوکترە. وتی: سواربە. کاتێك دەستم خستە سەر، هەوساری دەپچڕاند و ڕەمی دەکرد. جبرەئیل وتی: ئەی بوراق، هیچ پێغەمبەرێك ڕێزدارتر لای خوا لەموحەممەد سوار تۆ نەبوە. ئارەق بەناوچاوانیدا هاتەخوار و بۆ من دەستەمۆ بوو. کەوتە سەر ئەرز تا سواری بوم. جبرەئیل منی لەگەڵ خۆی بەرەو مزگەوت (لەپێشترین) (المسجد الاقصى) برد. دوو کاسەیان بۆ هێنام: یەکیان پڕ لەشیر، یەکیان پڕ لەبادە. پێیان وتم: یەکیان هەڵبژێرە. شیرم هەڵبژارد و خواردم. پێیان وت: کردارت لەسەر بنەمای سورشتی خۆت بوو. ئاگاداربە ئەگەر بادەت هەڵبژاردایە، خەڵکەکەت لەدوای تۆ گومڕا دەبون. بەرێکەوتین: پێی وتم: دابەزە. دابەزیم و نوێژم خوێند. وتی: ئەمە توری سینایە کەخوا لێرە لەگەڵ موسا قسەی کرد. دواتر بەرێکەوتین تا گەیشتینە بیت

الموقەدەس. کاتێك گەشتینە درگای مزگەوتەکە، جبرەئیل منی دابەزاند و بوراقی بەو دارەوە بەستەوە کەپێغەمبەرانیتر دەیان بەستەوە. کاتێك ڕۆشتمە ناو مزگەوتەکە؟، بینیم پێغەمبەرەکان دەوریانگرتووم. دەستەیەك دەڵێن: ڕۆحی ئەو پێغەمبەرانە بوون کەلەپێش من نێردرابوون. هەموویان سڵاویان بۆ ناردم. وتم: ئەی جبرەئیل: ئەمانە کێن؟ وتی: براکانت، پێغەمبەرەکان. قورەیشییەکان گومانیان دەکرد خوا شەریکی هەیە و مەسیحیەکان گومانیان دەکرد خوا شەریك یا کوڕی هەیە. ئەمە ئەوەیە کەخوای گەورە فەرموویەتی: لەپێغەمبەرەکانی پێش خۆت بپرسە ئایا ئێمە جیاواز لەخواوەند، خواوەندی دیکەمان دروست کردووە تا بیپەرستن (زخرف/٤٣/٤٥). پێغەمبەران هەموویان باوەڕیان بەتاقانەیی خوای گەورە هێناوە. دواتر جبرەئیل ئەوانی کۆکردەوە و منی کردە پێش نوێژ و دو رکعەت نوێژم لەگەڵ ئەوان خوێند.

دواتر جبرئەیل منی بەرەو (تەختە بەرد) ((سخرە)) برد و منی خستە سەری، بینیم پەیژەیەك بۆ ڕۆشتنە سەرەوە بۆ ئاسمان لەوێیە، کەبینەران دیمەنێکی جوانتر لەویان بەچاو نەدەبینی و لێرەوە بوو فریشتەکان دەڕۆشتنە سەر. پایەکەی لەتەختە بەرد لەبەیت ئەلموقەدەس و سەرەکەی بەئاسمانەوە لکا بوو. جبرەئیل منی هەڵگرت و خستییە سەر باڵەکانی خۆی و منی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ئەمە (ئاسمانی جیهان) بوو کەداوای کرد بۆمنی بکەنەوە. وترا: کێیە؟ وتی: جبرەئیلم. وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محەممەد. پرسیان: ئەویان بۆ پێغەمبەری هەڵبژاردووە؟ وتی: بەڵێ: وتیان: ئافەرین و بەخێر هاتن پێشکەش بەو بێت. دەرگا کرایەوە و ئێمە ڕۆشتینە ناو. پیاوێکم بینی سەراسەر ڕازاوە، تەندروست و ڕاست کەلای ڕاستی ئەو دەرگایەك بو بۆنی خۆشی لێ دەهاتەدەر و لای چەپی دەرگایەك کەبۆنی ناخۆش. کاتێك ئەو پیاوە ڕازاوە چاکەکارە سەیری لای ڕاستی خۆی دەکرد، پێدەکەنی و کاتێك سەیری دەرگای چەپی دەکرد، دەگریا. پرسیم: ئەمە کێیە و ئەمە دەرگایانە چین؟ وتیان: باوکت، ئادەم. لای ڕاستی ئەو دەرگای بەهەشتە و کاتێك سەیری دەکات و منداڵەکانی خۆی دەبینێت دەڕۆنە بەهەشت، پێدەکەنێت و درگای چەپی ئەو جەهەننەمە و کاتێك سەیری دەکات و هەندێك

لەمناڵەکانی خۆی دەبینێت دەڕۆنە جەهەننەم، دەگریت و خەمبار دەبێت. دواتر منی بۆ ئاسمانی دووەم بەرز کردەوە و داوای کردنەوەی دەرگاکانی کرد، وتیان: کێیت؟ وتی: جبرەئیلم. پرسیان: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محەممەدە. وتیان: ئایا بۆ پەیام ناردن هەڵبـژێردراوە؟ وتی: بەڵێ. وتیان: سلاوی خوای لێبێت، ئاقەرین و بەخێر بێت. دەرگا کرایەوە و ئێمە ڕۆشتینە ناو، لەوێ دوو گەنجمان بینی. وتم: ئەی جبرەئیل ئەمانە کێن. وتی: عیسا کوڕی مریەم و یەحیا کوڕی زەکەریا.

دواتر منی بۆ ئاسمانی سێیەم بەرز کردەوە و داوای کرد درگاکان بکەنەوە. وترا: کێیت. وتی: جبرەئیلم. وترا: کێ لەگەڵ تۆدایە؟ وتی: محەممەد. وتیان: ئەویان بۆ پێغەمبەری هەڵبژاردووە؟ وتی: بەڵێ. وتیان: سلاوی خوای لێ بێت و بەخێر بێت. ڕۆشتینە ناو و پیاوێکم بینی لەهەمووان جوانتر بوو. وتم: ئەی جبرەئیل، ئەمە کێیە. وتی: یوسفی برات.

دواتر منی بۆ ئاسمانی چوارەم برد و داوای کرد دەرگاکان بکەنەوە. وترا: کێیت؟ وتی: جبرەئیلم. وترا: کێ لەگەڵ تۆدایە. وتی: محەممەد. وتیان: هەڵبژێردراوە؟ وتی: بەڵێ. وتیان: سلاوی خوای لێ بێت و بەخێر بێت. ڕۆشتینە ناو و پیاوێکم بینی. وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: ئیدریس کەخواوەند پێگەی ئەوی بەرز کردۆتەوە.

دواتر منی بۆ ئاسمانی پێنجەم برد و داوای کرد دەرگاکان بکەنەوە. وترا: کێیت. وتی: جبرەئیلم. وتیان: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محەممەد. وتیان: هەڵبژێردراوە؟ وتی: بەڵێ. وتیان: بەخێر بێت و سلاوی خوای لێبێت. ڕۆشتینە ناو، پیاوێکم بینی دانیشتووە و خەڵکانێك دەوریان گرتووە و ئەویش چیرۆکیان بۆ دەگێڕێتەوە. وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: هارونە و خەڵکەکەی دەوری مناڵەکانی ئیسرائیلن.

دواتر منی بۆ ئاسمانی شەشەم برد و داوای کرانەوەی دەرگاکەی کرد. وتیان: کێیت؟ وتی: جبرەئیلم. وتیان: کێ لەگەڵ تۆدایە؟ وتی: محەممەد. وتیان: ئایا خوا ئەوی بۆ پێغەمبەری هەڵبژاردووە؟ وتی: بەڵێ. وتیان: بەخێر بێت. ڕۆشتینە ناو. پیاوێکم بینی دانیشتبوو، لای ئەو تێپەڕین. پیاوەکە زۆر بەکوڵ دەگریا. وتم: ئەی

جبرەئیل، ئەمە کێیە؟ وتی: موسا. وتم: بۆ دەگریت؟ وتی: ئیسرائیلیەکان گومان دەکەن من لای خوا لەئادەم ڕێزدارترم و ئێستا ئەم پیاوە کەلەمناڵەکانی ئادەمە ( و ناوی محەممەدە) پێش من کەوتۆتەوە.

دواتر منی بۆ ئاسمانی حەوتەم برد و هاواری کرد دەرگاکە بکەنەوە. وتیان: کێیت؟ وتی: جبرەئیل. وتیان: کێ لەگەڵ تۆدایە؟ وتی: محەممەد. وتیان: بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردراوە؟ وتی: بەڵێ. وتیان: بەخێر بێت و سڵاوی خوای لێبێت. ڕۆشتینە ناو وپیاوێکم بینی لەسەر کورسییەك لەبەر دەرگای بەهەشتا دانیشتبوو، قژی ڕەش و سپی بوو. خەڵکانێك لەدەوری بوون سپی هاوشێوەی کاغەز، دەستەیەکیتریشی لێبوو کەڕەنگیان کەمێك تێکەڵەی تیابوو. ئەوانەی ڕەنگیان تێکەڵەی تیا بوو، هەستان و لەجۆگەیەکدا خۆیان شۆرد و هاتنەدەر کەروخساریان وەك روخساری هاورێکانیان سپی ببوو. وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: باوکت ئیبراهیم. ئەم سپی روخسارانەی دەوروبەری ئەو کەسانەن باوەڕی خۆیان تێکەڵ بەستەم نەکرد. ئەوانەی تێکەڵەیەك لەرەنگ لەروخساریاندا بوو، ئەو کەسانەن باوەڕی خۆیان تێکەڵ بە خراپەکاری کرد و دواتر بۆ لای خوا گەڕانەوە و خوا ئەوانی بەخشی. ئیبراهیمم بینی پشتی ناوە بەدەرگایەك. جبرەئیل وتی: ئەمە ماڵی ئاوەدان (البیت المعمور)ە کە رۆژانە هەفتا هەزار فریشتە دەڕۆنە ناوی و هەرگیز نایەنەدەر.

دەڵێت: جبرەئیل منی هەڵگرت و ئێمە گەشتینە ((لەپێشترین شوێن)) (سدرە المنتهی) و بینیم داری سەدر لەوێ سەریان بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوە و لەتە جیوە زەردەکانی لەبەرزایی کوێستانەکانی (هجر) دەچێت. لەبن ئەو دارانەوە چوار ڕووبار خوڕەیان دەهات: دووان لەناوەوە و دووان لەدەرەوە. ئەو دووانەی لەناوەوە بوون و شاراوە، لەبەهەشتا بوون و ئەو دووانەی دەرەوە، نیل و فورات بوون. سەراسەری ئەوێ بەتیشکی خوایی داپۆشرابوو. فریشتەکەیان ئەوێیان پڕ کردبوو، دەتوت لەترسی خوا لەکوللەی زێڕین دەچوون. هەموویان بەشێوەیەك گۆڕان کەکەس ناتوانێت وەسفی بکات. جبرەئیل لەناو ئەواندا وەستا. جبرەئیل وتی: ئەی محەممەد بڕۆرە پێش. من و جبرەئیل ڕۆشتینە پێش تا گەشتینە پەردەیەك. فریشتەیەك منی هەڵگرت و جبرەئیل بەدواما نەهات. وتم: بۆ کوێ؟ وتی: شوێنی

هیچ کام لەئێمە نییە مەگەر ئەوەی پێگەکەی زانراوە (صافات/٣٧/١٦٤). ئێرە کۆتایی ئافرێنراوەکانە.

بەهەمان شێوە دەڕۆشتمە پێش تا گەشتمە عەرش. هەموو شتێك لەبەرابەر عەرشدا سەری کوڕنوشی دانەواندبوو. زمانم لەترس و شکۆی خواوەند گیرا. دواتر خوا زمانی منی کردەوە. وتم: سڵاوی بێ کۆتایی و درودی فراوان بۆ خواوەندی جیهانیان. خوا لەسەر من و خەڵکەکەم لەشەو ڕۆژدا پەنجا نوێژی پێویست کرد. بۆ لای جبرەئیل گەڕامەوە، دەستی گرتم و منی بۆ لای بەهەشت برد. چەندین کۆشکم بینی هەموویان لەبەردە گرانبایییەکان، لەژێریانەوە ڕووبارەکان سپیتر لەشیر و شیرینتر لەهەنگوین. ڕووبارەکان لەسەر لم لەگەهەرەکان و زوموڕودەکان. جبرەئیل وتی: ئەمە هەمان کەوسەرە کەخواوەند بەتۆی بەخشیوە. دواتر دۆزەخیان نیشاندام. من زنجیرەکان، بەندەکان، مارەکان و دووپشکەکانیم بینی و سەیرم کرد چۆن دۆزەخییەکان ئەشکەنجە دەکەن.

منی هێنایەدەر و بەرەو خوارەوە بەرێکەوتین تاگەشتینە لای موسا. پرسی: خوا چی لەسەر تۆ و خەڵکەکەت پێویست کرد؟ وتم: پەنجا نوێژ. موسا وتی: من پێشتر منالەکانی ئیسرائیلم لەسەر کەمتر لەمە تاقی کردەوە و هەرچەند توانیم داوام لەوان کرد و لێم قورس کردن و چەندین ڕێگە چارەم گرتەبەر، بەڵام نەیانکرد. بگەڕێرەوە بۆ لای خواوەند و داوای کەمبونەوەی لێ بکە. بۆ لای خوا گەڕامەوە و داوای کەمبونەوەم لێکرد. دە نوێژی لەسەر من هەڵگرت. بۆ لای موسا گەڕامەوە و ئاگادارم کردەوە. وتی: بگەرێرەوە و داوای کەمبونەوە بکە. گەڕامەوە و خوا دەنوێژتری بۆ کەمکردمەوە. بەهەمانشێوە لەنێوان موسا و خوادا لەهاتووچۆدا بوم تا خوا نوێژەکانی کردە پێنج. موسا وتی: بگەرێرەوە و داوای کەمبونەوە بکە. وتم: لەخوا شەرم دەکەم و ناگەڕێمەوە. لەم کاتەدا بەمنیان وت: من لەسەر تۆ و خەڵکەکەت پەنجا نوێژم پێویست کرد بەڵام ئێستا ئەم پێنج نوێژە لەبەرابەر پەنجا نوێژ وەردەگرم و باری سەرشانی بەندەکانم سوك کرد. دواتر من و جبرەئیل هاتینە خوار تا گەشتینە شوێن خەوەکەی من. هەمووی ئەمانە لەیەك شەودا ڕوویدا.

کاتێك بۆ مەککە گەڕایەوە، زانی خەڵك بەراستگۆی نازانن. لەبەر ئەمە لەمزگەوتا

دانیشت و ئەژنۆی خەمی گرتە باوەش. ئەبوجەهل لایەوە تێپەری و بەپێکەنینەوە لێی پرسی: ئایا دوێ شەو هیچ بەهەرەیەکت برد؟ وتی: بەڵێ، دوێ شەو منیان لێرەوە بۆ بەیت ئەلموقەدەس برد. ئەبوجەهل وتی: و ئێستا لەناو ئێمەدایت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەڵێ. ترسا ئەم گفتوگۆیە بۆ خەڵك باس بکات و پێغەمبەر(د.خ) بەراستی نەزانێت. ئەبوجەهل وتی: ئایا ئەمە بۆ خەڵکەکەت باس دەکەیت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەڵێ. ئەبوجەهل وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی منداڵەکانی کەعب کوری لوئەی کۆببنەوە. هەموویان هاتن. پێغەمبەر(د.خ) رووداوەکەی بۆ باس کردن. هەندێك بەراستگۆیان زانی و هەندێك بەدرۆزن و هەندێك بەدەست و زمان هاواریان کرد و هەندێك دەستیان خستە سەرسەر. ئەوانەی باوەڕیان پێ کردبوو و بەراستگۆیان زانی، لێی هەڵگەڕانەوەو ناباوەڕ بون.

خەڵکانێك لەبت پەرستان ڕایان کرد بۆ ماڵی ئەبوبەکر و وتیان: ئەم هاورێیەی تۆ گومانی لەم شێوە و لەو شێوە دەکات! ئەبوبەکر وتی: ئەگەر ئەو ئەمەی وتبێت، بێ گومان راست دەکات چوونکە بۆ شتی زۆر گەورەتر لەمە ئەو بەراستگۆ دەزانم. سەبارەت بەمیعراج ئەو بەراستگۆ دەزانم. لەو کاتەوە ئەویان بەئەبوبەکری راستگۆدانەر ناودەبرد.

بت پەرستەکان وتیان: ئەگەر راست دەکەیت، المسجد القصی بۆ ئێمە وەسف بکە. دەڵێت: دەستم بەباسکردنی نیشانەکانی کرد کەهەموویانم بیرچوویەوە. لەم کاتەدا ئەو مزگەوتەیان هێنایە بەرچاوی من بەشێوەیەك دەمتوانی ببینم. دەستم بەوەسفکردنی کرد و نیشانەکانیم باس کرد. وتیان: ئێمە لەکاروانەکانمان ئاگادار بکەرەوە. وتم: لای منداڵەکانی فلاّن کەس لەشوێنێك بەناوی (رەوحا) تێپەریم. وشترێکیان ون کردبوو و بەدوایدا دەگەڕان. من کاسەیەك ئاوم لێوەرگرتن و خواردمەوە. لەوان بپرسن. لای کاروانی منداڵەکانی فلاّن و فلاّن تێپەریم و سوارەیەك و پیادەیەکم بینی. ئەوان لەشوێنێك بەناوی (زی مورە) بوون. وشتری گەنجێکیان رەمی کرد و فلاّنکەس کەوت و دەستی شکا. لەو دووانە بپرسن. لەشوێنێك بەناوی (تەنعیم) لای کاروانی ئێوە تێپەریم کەوشترێکی خۆڵەمێشی رەنگ لەپێشیانەوە بوو و دووتای پێکەوە دووراویان لێ بار کردبوو. ئەم کاروانە

بەیانی لەکاتی هەڵاتنی خۆر دەگاتە لای ئێوە.

ئەوان ڕۆشتنەدەر و ڕۆشتنە سەر تەپۆڵکەیەك و چاوەڕوانی هەڵاتنی خۆریان دەکرد تا ئەو بەدرۆزن لەقەڵەم بدەن. لەناکاو یەکێك وتی: ئەوە خۆر هەڵات. یەکیتر وتی: ئەوە کاروانەکەیش دەرکەوت. لەپێشەوە وشترێکی خۆڵەمێشی ڕەنگە بەهەمان شێوە کەوتی. ئەوان باوەڕیان نەهێنا و وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

## جیاوازی سەبارەت بەوەی کێ یەکەم کەس باوەڕی هێنا

زاناکان سەبارەت بەیەکەم کەس کەباوەڕی هێنا، جیاوازییان هەیە هەرچەندە کۆکن لەسەر ئەوەی خەدیجە لەیەکەم ئافرێنراوەکانی خوا بوو کەباوەڕی بەئیسلام هێنا. دەستەیەك وتوویانە: یەکەم پیاوێك باوەڕی بەئیسلام هێنا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. لەعەلی دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: من بەندەی خوا و برای پێغەمبەرەکەی ئەوم. من ڕاستگۆ دانەری یەکەمم و هەرکەس دوای من خۆی بەیەکەم کەس دابنێت، درۆزنە و درۆ دەکات. حەوت ساڵ پێش لەخەڵکانیتر دەستم بەنوێژ خوێندن لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کرد.

عەبدوڵڵە کوڕی عەباس دەڵێت: یەکەم کەس کەنوێژی خوێند، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆژی دووشەممە بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردرا و عەلی ڕۆژی سێشەممە نوێژی خوێند. زەید کوڕی ئەرقەم دەڵێت: یەکەم کەس باوەڕی بەئیسلام هێنا عەلی کوڕی ئەبی تالیبە. عەفیفی کەندی دەڵێت: پیاوێکی بازرگان بووم، لەکاتی حەج کردن ڕۆشتمە مەککە و چوومە لای عەباس. کاتێك لای ئەو بووم، لەناکاو پیاوێك هات و بەرەو کەعبە ڕۆشت و بۆ نوێژ وەستا. دواتر ژنێك هات و لەپشت سەری ئەو نوێژی خوێند. دواتر کوڕێك هات و لەپشت سەری ئەوان بۆ نوێژ کردن وەستا. وتم: ئەی عەباس، ئەم ئایینە چییە؟ وتی: ئەمە کوڕی براکەی من محەممەد کوڕی عەبدوڵڵەیە. گومان دەکات خوا بۆ پێغەمبەری ئەوی هەڵبژاردووە. هەروەها گومان دەکات گەنجی خوسرەوەکانی ئێران و قەیسەرەکانی ڕۆم بۆ ئەو دەبن. ئەم ژنە هاوسەرەکەی ئەو خەدیجەیە کەباوەڕی پێی هێناوە و ئەم

کوڕەیش عەلی کوڕی ئەبی تالیبە. سوێند بەخوا بێ گومان دەزانم جیاواز لەم سێ کەسە کەس شوێنکەوتوی ئەم ئایینە نییە لەسەر ڕووی زەوی! عەفیف وتی: خۆزگە من چوارەم کەس دەبووم.

محەممەد کوڕی مونزەر و ڕەبیعە کوڕی باوکی عەبدولڕەحمان و باوکی حازم مودەنی و کەلبی دەڵێن: یەکەم کەس کەباوەڕی هێنا، عەلی کوڕی ئەبی تالیبە کەتەمەنی لەم کاتەدا نۆ یا یانزە ساڵ بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم کەس باوەڕی بەئیسلام هێنا، عەلی بو کەتەمەنی لەم کاتەدا یانزە ساڵان بو.

لەبەخشینەکانی خوا بۆ عەلی ئەوەبوو کەقورەیشییەکان گیرۆدەی وشکەساڵی و گرانی بونەوە. ئەبوتالیب نانخۆری زۆری بوو. ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) بەمامەکەی عەباسی وت: ئەبو تالیب خێزاندارە، بابڕۆینە لای ئەو باری سەرشانی سوك بکەین. ئەو دووانە ڕۆشتنە لای ئەبو تالیب و مەبەستەکەی خۆیان باس کرد. ئەبو تالیب وتی: عەقیل لای من بەجێ بێڵن و چیتان دەوێت، ئەنجامی بدەن. پێغەمبەر(د.خ) عەلی هەڵگرت و عەباس جەعفەر. عەلی بەهەمان شێوە لەماڵی پێغەمبەر(د.خ) مایەوە تا خوا بۆ پێغەمبەری هەڵیبژارد و عەلی باوەڕی پێ هێنا.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دەیویست نوێژ بخوێنێت، هاوڕێ لەگەڵ عەلی دەڕۆشتە یەکێك لەدۆڵەکانی پشت مەککە. ئەو دووانە پێکەوە نوێژیان دەخوێند و دەگەڕانەوە. جارێك ئەوبتالیب ئەو دووانەی بینی، پرسی: کوڕی براکەم، ئەم ئایینە چییە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئایینی خواوەند و پێغەمبەران و فریشتەکان، ئایینی باوکمان ئیبراهیم. خوا منی بەو ئایینەوە بۆ لای بەندەکانی ناردووە. تۆ شیاوترین کەسی بۆ سەر ئەم ئایینە بانگت بکەم و شیاوترین کەسیت باوەڕ بەم ئایینە بێنیت. ئەبوتالیب وتی: ناتوانم دەست بەرداری ئایینی باوك و باپیرانی خۆم بم، بەڵام سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی زیندووم، قورەیشییەکان ناوێرن زیان بەتۆ بگەیێنن.

جەعفەر لای عەباس مایەوە تا باوەڕی بەئیسلام هێنا و لەعەباس بێ نیاز بوو. ئەبوتالیب بەعەلی کوڕی وت: ئەم ئایینە چییە هەڵتبژاردووە؟ عەلی وتی: ئەی باوکە، باوەڕم بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێنا و لەگەڵ ئەودا نوێژم خوێند. ئەبوتالیب

وتی:پێغەمبەر(د.خ) هیچ کات تۆ بۆ سەر ڕێگای خراپ نابات، بەردەوام لەگەڵ ئەودابە.

دەستەیەك دەڵێن: یەکەم کەس باوەڕی بەئیسلام هێنا، ئەبوبەکر کوڕی بوقحافە بوو. شەعبی دەڵێت: لەعەبدوللە کوڕی عەباسم پرسی: یەکەم کەس باوەڕی هێنا کێ بوو؟ وتی: ئایا وتاری حسان کوڕی سابتت نەبیستوە کەدەڵێت:

| | |
|---|---|
| اذا تذكرت شجوا من اخى ثقة | فاذكر اخاك ابابكر بما فعلا |
| خير البرية اتقاها و اعدلها | بعد النبى و اوفاها بما حملا |
| الثانى التالى المحمود نشهده | و اول الناس منهم صدق الرسلا |

واتاکەی: ئەگەر سەبارەت بەبرادەرێکی بەهێز و خۆڕاگر هیچت لەبیرە، براکەت، ئەبوبەکر بیربێنەرەوە، باشترین و خۆپارێزترین و دادپەروەرترینی خەڵکان دوای پێغەمبەر(د.خ)، کەپێبەندی ئەوبوو، وتبووی: دووەم جێگر و کارەکانی پەسەند کراو. یەکەم کەس بوو پێغەمبەری بەراستگۆ زانی.

عەمرۆ کوڕی عەبەسە دەڵێت: لەعەکاز ڕۆشتمە لای پێغەمبەری خوا و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، چ کەسێك لەم کارەدا لایەنگری لەتۆ کرد؟ وتی: بەندەیەك و ئازادەیەك. بیلال و ئەبوبەکر. لەم کاتەدا خۆم باوەڕم هێنا و بووم بەچوارەم باوەڕدار.

ئەبوزەر دەیوت: خۆم بەچوارەم باوەڕدار دەزانی کەپێش من جگە لەمان کەس باوەڕی نەهێنابوو: پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوبەکر، بیلال. ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێت: یەکەم کەس باوەڕی هێنا، ئەبوبەکر بوو.

دەستەیەك دەڵێن: زەید کوڕی حارسە یەکەم کەس بوو باوەڕی هێنا. زوهری و سلێمان کوڕی یەسار و عیمران کوڕی باوکی ئەنس و عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێن: یەکەم کەس باوەڕی هێنا، زەید کوڕی حارسەیە. ئەو لەگەڵ عەلی بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بوون. پێغەمبەر(د.خ) لەنیمەڕۆدا دەڕۆشتە مالی خوا و نوێژی نیمەڕۆی دەخوێند و قورەیشییەکان بۆ ئەم کارە رەخنەیان لێنەدەگرت. کاتێك نوێژەکانی تری دەخوێند، عەلی و زەید پاسەوانیان لێدەکرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم پیاوەکان دوای پێغەمبەر(د.خ) باوەڕیان بەئیسلام

هێنا، عەلی و زەید کوڕی حارسە بوون. دواتر ئەبوبەکر باوەڕی هێنا و باوەڕی خۆی ئاشکرا کرد. ئەو پاسەوانی خەڵکەکەی خۆی و خۆشەویستی ئەوان بوو. لەهەمووان زیاتر ئاگاداری رەچەڵەك و نەژادی قورەیشییەکان بوو. پیاوێکی بازرگان و کەخەڵك لای ئەو کۆدەبونەوە و ئەوکەسە بڕواپێکراوەکانی خۆی بۆ باوەڕهێنان هاندەدا. ئەم کەسانە لەسەر دەستی ئەو باوەڕیان بەئیسلام هێنا: عوسمان کوڕی عەففان، زوبەیر کوڕی عەوام، عەبدولڕحمان کوڕی عەوف، سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و تەڵحە کوڕی عوبەیداللە. ئەوانی بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەمە لەکاتێکدا بوو ئەوان ئیسلامیان هەڵبژاردبوو و نوێژیان دەخوێند. ئەوان پێشەنگەگانی ئیسلام بوون. دواتر خەڵکانیتر یەك لەدوای یەك باوەڕیان هێنا تا ئیسلام لەمەککە گشتیگر و خەڵك باسیان لێوەدەکرد.

واقدی دەڵێت: ئەبوزەر چوارەم یا پێنجەم کەسە باوەڕی بەئیسلام هێنا و عەمرۆ کوڕی عەبەسەی سولەمی چوارەم یاپێنجەم کەسە. خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس پێنجەم کەس بوو. کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەو و هاوسەرەکەی هومەینە کچی خەلەف کوڕی ئەسعەد کوڕی عامر کوڕی بیازی خوزاعی، دوای دەستەیەکی زۆر لەخەڵك باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

کەواتە بۆمان دەرکەوت عەلی کوڕی ئەبی تالیب یەکەم کەسە باوەڕی بەئیسلام هێنا.

## فەرمانی خوا بە پێغەمبەر( د.خ ) بۆ ئاشکرا کردنی بانگەوازەکەی

دواتر خوای گەورە سێ ساڵ دوای هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ)، فەرمانی پێدا، بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات وشوشەی نهێنی بوونی ئەم بانگەوازە بەبەرد بشکێنێت. پێشتر، لەم سێ ساڵەدا بەنهێنی بانگەوازەکی خواپەرەستی دەکرد و جگە لەوکەسانەی باوەڕی پێیان بوو، بۆ کەسی دیکەی ئاشکرا نەدەکرد. کاتێك هاوەڵەکانی دەیانویست نوێژ بخوێنن، دەڕۆشتنە دۆڵەکان و خۆیان دادەشارد. ڕۆژێك سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و عەمار کوڕی یاسر و عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود و خەباب کوڕی ئەرەت و سەعید کوڕی زەید لەدۆڵێکدا نوێژیان دەخوێند کەدەستەیەك لەبتپەرستەکان لایانەوە تێپەڕین. ئەمە کەسانە لەناویاندا بوون: ئەبوسوفیان کوڕی حەرب، ئەخنەس کوڕی شەریق و کەسانیتر. جنێویان پێدان و کارەکەی ئەوانیان بەقێزەون لەقەڵەمدا و شەڕیان لەگەڵ کردن. سەعد شەویلاکی وشترێکی هەڵگرت و کێشای بەسەری یەکێك لەبتپەرستەکان و شکاندی. ئەمە یەکەم خوێن بو(بەوتەی هەندێ کەس) بۆ ئیسلام ڕژا.

عەبدوڵڵە کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك ئەم ئایە دابەزی کەنزیکترین خزمی خۆت ئاگادار بکەرەوە (شعرء/٢٦/٢١٤)، پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە سەر بەرزایی چیای سەفا و هاواری کرد: ئەی خەڵکینە کۆببنەوە. خەڵك کۆبونەوە. وتی: ئەی منداڵەکانی فلان و فلان، ئەی منداڵەکانی عەبدئولموتەلیب، ئەی منداڵەکانی عەبد مەناف، هەموویان لەدەوری کۆبونەوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر پێتان بڵێم سوارەکان لەپشت ئەم کێوەوە چیان و دەیانەوێت هێرش بکەنە سەرتان، ئایا بەراستگۆم دەزانن؟ وتیان: بەڵێ، ئێمە درۆمان لەتۆ نەبیستووە. وتی: ئێستا ئاگادارتان دەکەمەوە (ئەگەر باوەڕ بەخوا نەهێنن) گیرۆدەی ئازابێکی قورس دەبنەوە. ئەبولەهەب وتی: هاوار لەتۆ، ئایا ئێمەت بۆ ئەمە کۆکردۆتەوە؟ دواتر هەستا. لەم کاتەدا ئەم ئایە هاتەخوار: زیانبار بن دوودەستەکەی ئەبولەهەب، بەزوترین کات گیرۆدەی ئاگرێك دەبێت بڵێسەدار، نەسامانەکەی بەکەڵکی دێت، نە ئەوەی کۆی دەکاتەوە. ژنەکەی

بۆ بردنی مەشـەکەیەك ناتەوانە، تـەنافێك لەپێـستی خورما لەملیدایە (مەسـەد ١/١١١—٥).

جەعفەر کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی باوکی حەکەم دەڵێت: کاتێك خوا ئەم ئایەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) ناردەخوار کە: نزیکترین کەسەکانی خۆت ئاگادار بکەرەوە (شعراء ٢١٤/٢٦)، ئەم کارە لای پێغەمبەر(د.خ) دژوار و ئەوی پەرێشانکرد. نەخۆش ئاسا لەماڵەکەی خۆیدا خەوت. پورەکانی بۆ سەردان و چارەسەر کردنی لەماڵەکەی کۆبونەوە. وتی: گلەییم لەهیچ نییە و نەخۆش نیم.بەڵام خوا فەرمانی پێداوم نزیکترین کەسەکانی خۆم ئاگادار بکەمەوە و بۆ تاقانەیی خوا بانگیان بکەم. پورەکانی پێیان وت: ئەو کارە بکە و ئەبو لەهەب بانگ مەکە چوونکە وەڵامی تۆ ناداتەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بانگ کرد و هاتن و هاوریێ لەگەڵ ئەوان چەند پیاوێك لەعەبد مەناف و عەبدولموتەلیب بوون. هەموویان نزیکەی چل و پێنج پیاو دەبوون. ئەبولەهەب دەستی بەقسە کرد و وتی: ئەمانە مام و کوڕی مامەکانی تۆن. قسە بکە و واز لەکرداری منالانەی خۆت بێنە. ئاگاداربە خەڵکەکەی تۆ توانای خۆراگری لەبەرابەر هەموو عەرەبەکانیان نییە. شیاوترین کەسەکان بۆ گرتن و زیندانی کردنی تۆ، منالەکانی باوکی تۆن. هەروەها ئەگەر لەسەر بڕواکەت پێداگری بکەیت، گرتن و زیندانی کردنی تۆ بۆ ئەوان ئاسانتر دەبێت تا ئەوەی چەندین بنەماڵە لەقورەیشییەکان دژی تۆ ڕاپەڕن و عەرەبەکان هاوکارییان بکەن چوونکە من هیچ دواهاتێك خراپتر لەوەم نەبینیوە کەتۆ بۆ منالەکانی باوکتی بەدیدێنیت. پێغەمبەر(د.خ) بێدەنگ و لەو کۆڕەدا هیچی نەوت. ئەوسا جارێکیتر ئەوانی بانگ کردەوە و دەستی بەقسە کردن کرد و فەرمووی: سپاس بۆ خوا. ئەو دەپەرەستم و داوای هاوکاری لەو دەکەم و باوەڕی پێدێنم و خۆم بەو دەسپێرم. شایەتی دەدەم جگە لەخواوەندی جیهان خواوەندێکیتر نییە و شەریکی نییە. دواتر وتی: پێشەنگەکان هیچ کات درۆ لەگەڵ خەڵکەکەی خۆیان ناکەن. سوێند بەو خوایەیی جگە لەو خوایەك نییە کەمن نێردراوی خوا بۆ لای ئێوەم بەتایبەت کەخزم و کەسوکاری منن و بۆ هەموو خەڵکان، بەشێوەیەك هەمووان دەبنە ئۆمەتی من. سوێند بەو خوایەیی بێگومان ئەو کاتەی دەخەون، دەمرن و ئەو کاتەی لەخەو

هەڵدەستن، زیندوو دەکرێنەوە و بۆ کارەکانتان لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکرێت. بەهەشت هەمیشەییە و ئاگر نەکوژاوە.

ئەبوتالیب وتی: ئارەزومانە هاوکاری تۆ بکەین و ئامۆژگارییەکانی تۆ لەگوێ دەگرین و باوەڕمان بەوتاری تۆ هەیە. تۆ بێ گومان ڕێزدارترینی ئێمەیت. ئەمانە منداڵەکانی باوکی تۆن لێرە کۆبونەوە. من یەکێك لەوانم. جیاواز لەوەی من زیاتر لەهەمووان بۆ هاتنە سەر سفرەکەی تۆ بەپەلەترم. بەرەو ئەو شتەی خوا فەرمانی پێداویت، بڕۆ پێش، سوێند بەخوا بەردەوام پارێزگاریت لێ دەکەم و پەنات دەدەم و پشتیوانت دەبم. بەڵام جەستەم هاوکاریم ناکات واز لەئایینەکەی عەبدولموتەلیب بێنم.

ئەبولەهەب وتی: سوێند بەخوا ئەمڕۆ خراپترە لەدوێنێ. ئەم خراپییە سەراسەرییە. دەستەکانی بگرن و بیبەستنەوە پێش ئەوەی کەسانیتر ئەو کارە بکەن. ئەبوتالیب وتی: سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی زیندوو بین، وەك گلێنەی چاومان پارێزگاری لێدەکەین.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: کاتێك ئەم ئایە هاتەخوار کە: خزم و کەس و کارە نزیکەکەت ئاگادار بکەرەوە (شعراء٢٦/٢١٤)، پێغەمبەر(د.خ) بانگی کردم و وتی: ئەی عەلی، خوا فەرمانی پێداوم خزمە نزیکەکانی خۆم ئاگادار بکەمەوە. من شڵەژاوم و دەزانم هەرکاتێك ئەم بانگەوازە بەگوێی ئەوان رابگەیێنم، پەرچەکردارێك دەبینم کەئازارم دەدات. لەبەر ئەمە بێدەنگیم هەڵبژارد تا ئەوەی جبرەئیل هاتە لام و وتی: ئەی محەممەد، ئەوەی فەرمانیان بەتۆداوە، ئەنجامی بدە. ئەگەر ئەنجامی نەدەیت، خواوەند ئەشکەنجەت دەدات. پێغەمبەر(د.خ) زیادی کرد: هەنووکە ئەی عەلی، پێوانەیەك خواردنمان بۆ دروست بکە و ڕانەمەڕێکی تێکە و دەفرێکی گەورەی پڕ شیر ئامادە بکە و منالەکانی عەبدولموتەلیب کۆبکەرەوە تا لەگەڵیان بپەیڤم و ئەوەی فەرمانیان بەمن داوە، ئەوانی لێ ئاگادار بکەمەوە. فەرمانەکانیم جێبەجێ کرد و دواتر ئەوانم کۆکردەوە. ژمارەیان دەگەشتە چل پیاو، یا پیاوێك زیاتر یا کەمتر. لەناو ئەوان مامەکانی ئەوتالیب، حەمزە، عەباس و ئەبولەهەب دەبینران. کاتێك کۆبونەوە بانگی کردم و فەرمووی خواردنی ئامادە کراوەکە بێنە.

کاتێك سفرەم ڕاخست و خواردنەکەم لەسەر دانا، پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەخواردن کرد و لەتە گۆشتێکی هەڵگرت و بەددان لێیکردەوە و دواتر لای سفرەکە داینا. دواتر وتی: بخۆن بەناوی خوا. خەڵك خواردیان بەشێوەیەك پێویستیان بەهیچ نەما و تێر بوون. جگە لەشوێن دەستەکانی ئەوان هیچم نەبینی. سوێند بەوخوایەی گیانی عەلی لەدەستی ئەودایە، هەرکام لەوان بەو ئەندازەی دەخوارد کەبۆ هەموویانم ئامادە کردبوو. دواتر فەرمووی، خواردنەوە بەم خەڵکە بدە. دەفرە شیرەکەم هێنا و ئەوان خواریانەوە تا ئەوەی هەموویان تێر شیر بوون. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ویستی قسە بکات، ئەبولەهەب قسەکەی پێ پچڕاند و وتی: سەرسوڕهێنەرە ئەو جادوەی ئەم پیاوە بۆ ئێوەی بەکار بردوە. خەڵك بڵاوەیان لێکرد و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەوان قسەی نەکرد. بەیانی ئەو ڕۆژە وتی: ئەی عەلی، ئەم پیاوە لەقسەکردن پێشم کەوتەوە، خواردنێکی هاوشێوەی ئەوەی ئامادەت کردبوو، ئامادە بکە و کۆیان بکەرەوە.

ئەو کارەم کرد کەپێشتر کردبووم. ئەوان خواردیان و من شیرم دەرخوارددان و هەموویان خواردیانەوە تا تێرشیر بوون. دواتر پێغەمبەر(د.خ) دەستی پێکرد و فەرمووی: ئەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، من لەناو ئێوەی عەرەب گەنجێك نابینم دیاری بۆخەڵکەکەی هێنابێت باشتر لەوەی من بۆم هێناون. من بەختەوەری ئەم جیهانە و ئەو جیهانەم بۆ هێناون. خوای گەورە فەرمانی پێداوم ئێوە بۆ سەر ئەم ئایینە بانگیشت بکەم. کام یەك لەئێوە دەیەوێت لەم کارەدا هاوکاریم بکات لەسەر ئەو بنەمایەی برادەر و سەرپەرەشتی کارەکانی من و جێنشینی من بێت. کەس وەڵامی نەدایەوە. من کەلەهەموویان بچوکتر و چاوەکانم گاڵتەئامێزتر و ورگم زلتر و قولاپەی پێم باریکتر بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من پشتیوانی تۆدەبم لەکارەکانت. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) ملی منی گرت و وتی: ئەمە برادەر و سەرپەرەشتی کارەکانی من و جێنشینی منە لەناو ئێوەدا. گوێ لەقسەکانی بگرن و فەرمانەکانی ئەنجام بدەن. دەڵێت: لەم کاتەدا خەڵك هەستان و بەپێکەنین و گاڵتە کردنەوە بەئەبوتالیبیان وت: فەرمانی بەتۆدا فەرمانبرداری کوڕەکەت بیت و وتەکانی ئەو ئەنجام بدەیت.

فەرمانیان بەپێغەمبەری خوادا، بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات و شووشەی نهێنی بەبەرد بشکێنێت و ئەوەی لای خواوە هێناویەتی، لەگەڵ خەڵکدا باسی بکات و لەگەڵ ئەوان بدوێت و خەڵك بۆ خواپەرەستی هان بدات. ئەو سەبارەت بەوەی لەسەرەتاکانەوە خوا بۆ ئەوەی ناردبوو، بۆ ماوەی سێ ساڵ بەنهێنی لەگەڵ خەڵك قسەی کرد تا ئەوەی فەرمانی پێدرا بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات. فەرمانی خوای ئاشکرا کرد و دەستی بەبانگەوازەکەی کرد. ئەوان خۆیانیان لێ دور نەخستەوە و جگە لەسووکە وەلامێك، وەڵامیان نەدایەوە تا ئەوەی لای خوا بەخراپی باسی کردن. کاتێك ئەم کارەی کرد بۆزیان گەیاندن بەو هاودەنگ بون مەگەر ئەوانەی خوا ئەوانی لەرێگەی باوەڕ هێنانەوە، پاراستبونی. ئەوانە خەڵکانێکی کەم بوون. مامەکەی ئەبوتالیب پەپولە ئاسا بەدەوریدا دەسورایەوە و پارێزگاری لێدەکرد و لەبەرابەر زیان گەیاندن بەو خۆڕاگری دەکرد. پێغەمبەر(د.خ) لەسەر فەرمانی خوا بەرێکەوت و کارەکەی ئەوی ئاشکرا کرد و هیچ کام لەمەبەستکانی پشت گوێ نەخست.

کاتێك قورەیشییەکان بینیان پێغەمبەر(د.خ) لەهەرکارێك کەدەبێتە هۆی رەنجاندنی ئەوان، کەمتەرخەمی ناکات و ئەبو تالیب لەپشتی وەستاوە و دەستی لێ هەڵناگرێت، چەندین پیاو لەوان ڕوویان لەئەبوتالیب کرد و لەوان: عوتەبە و شەیبە کوڕانی ڕەبیعە، ئەبوبەختەری کوڕی هوشام، ئەسوەد کوڕی موتەلیب، وەلید کوڕی موغەیرە، ئەبوجەهل کوڕی هوشام، عاس کوڕی وایل، نەبیە و مونەبە کوڕی حەجاج و چەندین کەسیتر کەلەگەڵ ئەوان بەرێکەوتن. ئەوان پێیان وت: ئەی ئەبوتالیب، کوڕی براکەی تۆ جوێن بەخواکانی ئێمە دەدات، دینی ئێمە بەکەم ناو دەبات و عەقڵی ئێمە بەلاواز و باوکانی ئێمە بەگومڕا. یا لەم کارە رێی لێدەگریت یا رێگەمان بۆ خۆش دەکەیت چوونکە تۆ وەك ئێمە ئایینێك جگە لەم ئایینەت نییە. ئەبوتالیب بەخۆشی قسەی لەگەڵ کردن و بەمیهرەبانی ئەوانی بەرێکرد. ئەوان لای ئەو گەڕانەوە و پێغەمبەر(د.خ) سەرسەختانە لەسەر کارەکانی بەردەوام بوو.

دواتر بارودۆخ لەنێوان ئەو و ئەوان ڕووی لەدژواری کرد بەشێوەیەك پیاوان لەیەك دورکەوتنەوە و ڕق و کینەی یەکیان لەدڵ گرت و قورەیشییەکان سەبارەت

بەپێغەمبەر(د.خ) گفتوگۆی زۆریان کرد و یەکتریان بۆ شەڕ دژی ئەو هاندەدا.

دووبارە ڕۆشتنە لای ئەبوتالیب و وتیان: ئەی ئەبوتالیب تۆ پیاوێکی پیریت و لەناو ئێمەدا سەروەریت. داوامان لێکردی کوڕی براکەت لەم کارانەی دووربخەیتەوە بەڵام نەتکرد. سوێند بەخوا، ئیتر ناتوانین بەم کارانەی ڕازی ببین چوونکە ئەو جوێن بەخواکانی ئێمەدەدات و بەخراپی لەباوکانمان دەدەوێت و بەکەم ئاوەز لەقەڵەممان دەدات. یا ئەو لەزیان گەیاندن بەئێمە دووردەخەیتەوە یا لەگەڵ تۆ و ئەودا شەڕ دەکەین و لەم ڕێگادا پیاوانە هەوڵ دەدەین تا یەکێك لەئێمە بەتەواوی لەناو بچێت یا وای لێبێت کەئەمانە داوای دەکەن. ئەمەیان بەئەبوتالیب وت و بڵاوەیان لێکرد.

بۆ ئەبوتالیب دژوار بوو لەخەڵکەکەی خۆی جیا ببێتەوە یا لەگەڵ ئەوان دوژمنی بکات. هەروەها ئارامی نەدەگرت پێغەمبەر(د.خ) بەوان بسپێرێت و دەست لەهاوکاری کردنی ئەو هەڵبگرێت. کەسی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و ئەوی لەوتەی قوڕەیشییەکان ئاگادار کردەوە و فەرمووی: من و خۆت لەناو مەبە و باری سەرشانم قورس مەکە کەنەتوانم بەرگەی بگرم. پێغەمبەر(د.خ) گومانی برد مامی بۆچوونی گۆڕیەوە و دەیەوێت دەست لەهاوکاری کردنی هەڵگرێت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: مامە گیان، ئەگەر خۆر بخەنە دەستی ڕاستی من و مانگ لەدەستی چەپم تا لەم کارە دەست هەڵگرم، ئەو کارە ناکەم و وازی لێ ناهێنم تا خوا ئاشکرای دەکات یا لەم ڕێگادا لەناو دەچم. ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) گریا و هەستا. کاتێك ڕۆشت، ئەبوتالیب بانگی کرد. پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە. ئەبوتالیب وتی: کوڕی براکەم، برۆ هەرکارێك دەتەوێت، ئەنجامی بدە کەسوێند بەخوا هیچ کات لەهیچ کارێکدا بەتەنیا جێت ناهێڵم.

کاتێك قوڕەیشییەکان زانیان ئەبوتالیب دەست لەهاوکاری کردنی پێغەمبەر(د.خ) هەڵناگرێت و خۆی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان ئامادە دەکات، عومارە کوڕی وەلیدیان بردە لای ئەو و وتیان: ئەی ئەبوتالیب، ئەمە عومارە کوڕی وەلید جوامێری قورەیش و قسەزانترین و جوانترینی ئەوانە. ئەو هەڵگرە و وەك مناڵی خۆت ڕایگرە تا عەقڵ و سامانی ئەو یارمەتیدەر بێت بۆ تۆ. کوڕی براکەت بەئێمە بسپێرە کە

ئاوزی ئێمە بەلاواز دەزانێت و دژی دینی تۆ و دینی باوکانی تۆ وەستاوەتەوە و خەڵکی لەیەك دورکردۆتەوە. ئەو بەئێمە بسپێرە تا خوێنی بڕێژین و هەمووان ئاسودە بکەین کە پیاو لەبەرابەر پیاودا بێت. وتی: چ ئەشکەنجەیەکی قێزەونە دەتانەوێت منی پێ گرفتار بکەن. ئایا کوڕەکەتان بەمن دەدن تا خواردن و خواردنەوەی پێ بدەم و کوڕەکەمتان تەسلیم بکەم تا خوێنی بڕێژن؟ سوێند بەخوا هیچ کات ئەمە ڕوونادات. مەتعەم کوڕی عودەی کوڕی نەوفل کوڕی عەبد مەناف وتی: سوێند بەخوا خەڵکەکەت لەڕووی دادپەروەرییەوە لەگەڵ تۆ دووان بەلام دەبینم ناتەوێت بەوتاری ئەوان رازی بیت. ئەبوتالیب وتی: سوێند بەخوا لەڕووی دادەوە قسەیان لەگەڵ نەکردم و ئەوە تۆیت هەمووانت بۆ وازهێنان لەهاوکاری کردنی من هاودەست کرد و دژی من ئەوانت کۆکردەوە. ئێستا، هەر کارێك دەتەوێت، ئەنجامی بدە.

لەم کاتەدا کێشەکە زیاتر دژوار و خەڵك ڕقی یەکیان لەدڵ گرت و لەیەك دورکەوتنەوە و قورەیشییەکان زەخیتان خستە سەر چەندین کەس لەبنەماڵەکانی قورەیش کەباوەڕیان بەئیسلام هێنابوو. هەر هۆزێك دژی باوەڕدارانی خۆی وەستایەوە و ئەوانی ئەشکەنجە دەکرد و دەیانخواست لەئیسلام هەڵگەڕێننەوە. خوا، پێغەمبەری(د.خ) لەسەر دەستی ئەبوتالیبی مامی پاراست. ئەبوتالیب لەناو قورەیش دەگەڕا و خەڵکی بۆ پاراستنی پێغەمبەر(د.خ) هان دەدا. هەموویان رازی بوون و دەوریان گرت جگە لەئەبولەهەب کەلەسەر خراپەکاری خۆی پێداگری دەکرد.

کاتێك ئەبوتالیب لەخەڵکەکەی ئەوەی بینی کەشادمانی کرد، دەستی بەوەسف کردنی ئەوان و دەستنیشان کردنی تایبەتمەندییە لەپێشەکانی پێغەمبەر(د.خ) کرد. قورەیشییەکان لەکاتی مردنی ئەبوتالیب ڕوویان لەماڵەکەی کرد و پێیان وت: تۆگەورە و سەروەری ئێمەیت. داوا لەکوڕی براکەت بکە و فەرمانی پێبدە دەست لەجوێندان بەخواکانی ئێمە هەڵگرێت و ئێمەیش دەست لەو و خواکەی هەڵدەگرین. ئەبوتالیب کەسی بەدوای پێغەمبەر(د.خ) نارد و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هات، پێی وت: ئەمانە گەورەکانی خەڵکی تۆن. لەتۆیان دەوێت دەست لەجوێندان بەخواکانیان هەڵگریت، ئەوانیش دەست لەتۆ و خواکەت هەڵدەگرن. پێغەمبەر(د.خ)

پێی وت: مامە گیان، مەگەر جگە لەوەیە من بۆ پەرەستینی شتێکی باشتر ڕێنوێنیان دەکەم؟ یەك وتە (تاقانەیی خوا) بێننە سەرزمان و ئەوسا عەربەکان دەبنە فەرمانبرداری ئەوان و عەجەمەکان دەبنە نۆکەری ئەوان. ئەبوجەهل وتی: سوێندت دەدەم بەگیانی باوکت ئەو قسەیە چییە تا دەجار بیڵێین و پێشکەشی تۆی بکەین. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بڵێن خوایەك جگە لەخوا نییە. تووڕە بون بڵاوەیان لێکرد و وتیان: داوای شتێك جگە لەمە بکە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر خۆر بێنن و بیخەنە سەردەستی من، جگە لەمەم ناوێت. دەڵێت: ئەوان تووڕە لای ئەو هەستان و وتیان: سوێند بەخوا کەتۆ و خواکەت کە بۆ کارەکانت فەرمانت پێ دەدات، جوێنباران دەکەین. گەورەکانی ئەوان بەرێکەوتن و وتیان: بڕۆن و لای خواکانتان خۆڕاگری بکەن، چوونکە دوورکەوتنەوە لەوانە، ئەوەی لەئێوەی داوا دەکەن. ئێمە شتی وامان لەدوایین ئایین نەبیستووە. ئەمە جگە لەدرۆیەکی دەسکرد هیچیتر نییە(ص/٢٨٦-٧). پێغەمبەر(د.خ) ڕوویکردە مامی و وتی: یەك وتە بێنەرە سەرزمان تا ڕۆژی کۆتایی لەسەر بنەمایی ئەو قسەیە لەبەرژەوەندی تۆ شایەتی بدەم. ئەبوتالیب وتی: ئەگەر ترسی ئەوە لەئارادا نەبوایە کەعەرەبەکان سەرکۆنەتان بکەن و بڵێن لەمردن ترسا، ئەم قسەم دەهێنایە سەرزمان. ئەم ئایە هاتەخوار: تۆ ئەو کەسەی دەتەوێت ناتوانێت ڕێنوێنی بکەیت، بەڵکو خوایە، هەرکەسی بوێت ڕێنوێنی دەکات و ئەو لەڕێنوێنی کراوان ئاگادارترە.(قصص/٢٨/٥٦).

## ئەشکە نجە کردنی زمان گیراوان

ئەمانە ئەو کەسانە بوون پێش کەسانیتر باوەڕیان بەئیسلام هێنا بەڵام هۆز و بنەماڵەیان نەبوو پارێزگاریان لێبکەن و خۆیشیان هێزی پاراستنی خۆیان لەبەرابەر ڕق و کینەی قورەیشییەکان نەبوو. ئەوانەی هۆزیان هەبوو تا پارێزگاریان لێبکەن، دەستی ناباوەڕانیان بۆ ئازاردان پێنەگەیشت. کاتێك قورەیشییەکان بینیان، ئەوان لەلایەن هۆز و بنەماڵەکانیانەوە پارێزگاریان لێدەکرێت، هەرهۆزێك دەستیان کرد بەئازاردانی زمانگیراوانی هۆزەکەی خۆیان و ئەوانیان بەلێدان، تینوویەتی، برسیەتی، ئاگر و گەرمی زەوی و ئاسمانی مەککە ئەشکەنجەدا تا لەدینەکەیان

پەشـیمانیان بکەنـەوە. هەنـدێکیان لەبـەر زۆری ئازارەکـانی ئەشـکەنجە وازیـان لەدینەکەی خۆیان هێنا بەڵام دڵیان لێوانلێو لەباوەڕ بوو و هەندێکیتر سەرسەختیان کرد و لەسەر دینەکەی خۆیان پێداگریان کرد و خوا ئەوانی پاراست.

یـەکێك لـەوان بـیلال کـوڕی ڕەبـاحی حەبەشـی کۆیلـەی ئەبوبـەکر بـوو. بـاوکی لەکۆیلـەکانی حەبەشـە و دایکـی کـەنیز بـوو. ئـەو زادەی بنەماڵـەیـەك لەگـەورەکان و نازنـاوی ئەبوعەبدوڵڵـەی پێبڕابـوو. بـیلال گەشـتە دەسـتی ئومەییـە کـوڕی خەلـەف جومەحی. کاتێك خۆر لەکاتی نیمەڕۆ دەگەشتە ترۆپکی گـەرمی خۆی، گەورەکـەی ئەوی لەسـەر پـشت و سـك بەسـەر زەویـدا ڕادەکێشا و فـەرمانی دەدا تاشـەبەردێکی گەورە و گەرم بێنن و لەسەر سکی داینێن. دەیوت: بەمشێوە دەمێنیتەوە تـا بمریت یـا بەمحەممـەد نابـاوەڕ و لات و عـوزا بپەرەسـتی. وەرەقـە کـوڕی نـەوفل لایـەوە تێدەپـەڕی و دەیبـینی لـەژێر ئەشـکەنجە دەناڵێنێـت و دەڵێـت: تاقانەیـە، تاقانەیـە. وەرەقە دەیـوت: ئـەی بیلال، بـەخوا کەتاقانەیـە. دواتـر وەرەقـە بەئومەییـەی دەوت: سـوێند بـەخوا ئەگـەر ئـەم پیـاوە بەمـشێوە بکـوژن، مـن بەخۆشەویـستی دایکانـە هەڵیدەگرم و دەبێتە هۆکاری بەختەوەریم. ئەبوبەکەر ئەشکەنجەدانی ئـەوی بینی و بەئومەییـە کوڕی جومـەحی خەلـەف وت: ئایـا لەبەرابـەر ئەشـکەنجەدانی ئـەم داماوە لەخوا ناترسیت؟ ئومەییە وتی: تـۆ ئـەوت خـراپ و گـومڕا کـرد. ئەبوبـەکر وتـی: مـن کۆیلەیەکی ڕەشم هەیە و چالاکتر لەمەیـە و لەسـەر دیـنی تۆیـە و دەبێتـە هـۆی کوێر بونی چاوی بینا. ئەو لەبەرابـەر ئەمـە بەتۆدەدەم. وتـی: ڕازیـم. ئەبوبـەکر کۆیلەکـەی خۆیدا بەو و بیلالی وەرگرت و لەڕێگەی خوادا ئازادی کرد. بیلال بۆ مەدینە کۆچـی کرد و لەهەموو شەڕەکان لای پێغەمبەر(د.خ) بوو.

یـەکیتر لـەوان بـاوکی یـەقزان عـەمار کـوڕی یاسـری عەنـسی بـوو. عـەنس یـەکێك لەبنەماڵـەکانی مناڵـەکانی مـورادە. ئـەو و بـاوك و دایکـی لەسـەردەمێکی زوودا باوەڕیـان بەئیـسلام هێنـا و لـەم کاتـەدا پێغەمبـەر(د.خ) لـەماڵی ئەرقـەم کـوڕی ئـەبی ئەرقـەم بـوو. ئـەوان سـی و حەوتـەمین کـەس لەموسـوڵمانان بـوون. ئـەو و سـۆهەیب لەیـەك ڕۆژدا باوەڕیـان بەئیـسلام هێنـا. یاسـر هاوپـەیمانی مناڵـەکانی مـەخزوم بـوو. ئـەوان، عـەمار و دایـك و باوکیـان دەنـاردە دەشـت و کاتێـك هـەوا گـەرم دەبـوو،

بەگـەرمی سـوتێنەری هـەتاو ئەشـکەنجەیان دەدان. پێغەمبـەر(د.خ) لای ئەوانـەوە تێپـەڕی و وتـی: خۆراگربن ئـەی بنەماڵـەی یاسـر کەجێگـەی ئێوە بەهەشتە. یاسـر لەژێر ئەشکەنجەدا مرد و ژنەکەی سومەییە قسەی ناشیرینی بەئوبوجەهل وت. ئەبو جـەهل ڕمێکـی بەدەسـتەوە بـوو، کـردی بەشـوێنی شـەرمی ژنەکـەدا و دەسـتبەجێ گیانی سپارد. ئـەو یەکـەم شەهیدی ئیسلامە. ئەشکەنجەیان لەسـەر عـەمار قورس کرد بەشێوەیەك جارێك بەگەرما ئازاریان دەدا و جارێکیتر تاشەبەردێکی گـەورەیان دەخـستە سـەر سـکی و جـارێکیتر بـەنوقمکردن لـەئاو و جارێـك بەبەسـتنی ڕێگـەی هەناسەدان. پێیان وت: بەرەڵا ناکەین تا جوێن بەمحەممەد بدەیت و لات و عوزا بپەرەسـتی. ئەو، ئـەو کـارەی کـرد. ئـەویان بـەرەڵا کـرد و یەکڕاسـت ڕۆشـتە لای پێغەمبـەر(د.خ) و دەسـتی بـەگریان کـرد. پێغەمبـەر(د.خ) پرسـی: چـی ڕوویـداوە؟ عەمار وتی: پێشهاتێکی زۆر خراپ ئەی پێغەمبەری خوا! کارم گەشتە ئەو شوێنەی فلاَن کار و فیسار کار بکەم. پێغەمبەر(د.خ) پرسی: ئەی دڵت؟ عـەمار وتـی: ئارام و لێوانلێـو لـەباوەڕ بەخواوەنـد. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: ئەگـەر دووبـارە ئەشـکەنجەیان کـردی، ئـەو کـارە بکـە. خـوای گـەورە ئـەم ئایـەی نـاردە خـوار: هـەر کـەس دوای باوەڕهێنان بەخوا ناباوەڕ بێت، سزای دەدرێت مەگەر ئەو کەسەی ناچار بێت بەڵام دڵی پڕ بێت لەباوەڕ. بەڵام ئەوکەسەی دەرگای دڵی بۆ ناباوەڕی کـردەوە، خـوا لێـی تـوڕە دەبێـت و ئەشـکەنجەیەکی قورسـی دەدات (نحـل/١٦/١٠٦). ئـەو لەسـەر بـاوەڕداری خـۆی مایـەوە تـا بـۆ مەدینـە کۆچـی کـرد و لەهـەموو شـەڕەکانی لای پێغەمبەر(د.خ) شەڕی کرد تا لەشەڕی سەفین لای عەلی کوژرا و لـەم کاتـەدا تەمـەنی زیاتر لەنەوەد ساڵ بوو. هەندێك دەڵێن: نـەوەد و سـێ و هەنـدێك دەڵێن: نـەوەد و چـوار. پێغەمبـەر(د.خ) سـەبارەت بـەو دەڵێـ: بەدەسـتی سـوپایەکی سـتەمکار دەکوژرێت.

یـەکێتریان خـەباب کـوڕی ئـەرەب بـوو. بـاوکی پیـاوێکی سـوادی لەکەسـکەر بـوو. دەستەیەك لەخەڵکانی ڕەبیعـە بەئەسیری گرتیـان و بردیـان بـۆ مەککە و فرۆشـتیان بەسیباع کوڕی عەبدولعوزەی خـوزاعی هاوپـەیمانی مناڵـەکانی زوهـرە. سـەباع ئـەو کەسـە بـوو لەشـەڕی ئۆحـۆد لەگـەڵ حـەمزە شـەڕی دەسـتەویەخەی کـرد. خـەباب

پیاوێکی تەمیمی بوو. ئەو زۆر زوو باوەڕی بەئیسلام هێنا. دەڵێن شەشەمین کەس بوو باوەڕی هێنا. پێش هاتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماڵی ئەرقەم بوو. ناباوەڕان ئەویان گرت و بەسەختی ئەشکەنجەیان کرد. ئەویان ڕووت دەکردەوە و هەندێکات پشتیان دەخستە سەر زەوی گەرم و هەندیٚ کات بەردی گەرمیان بەئاگرەوە لەسەر پشتی دادەنا. سەریان بادا و ملیان شکاند بەڵام ئەو وەڵامی هیچ کام لەداواکارییەکانی ئەوانی نەدایەوە. بۆ مەدینە کۆچی کرد و لەهەموو شەڕەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەشداریکرد. دواتر لەکوفە مایەوە و لەساڵی ٣٦کۆچی/٦٣٧زایینی کۆچی دوایی کرد.

یەکێتر لەوان سوهەیب کوڕی سەنانی ڕۆمی بوو. ئەو لەنەژادی ڕۆم نەبوو بۆیە بەو ناوە بانگدەکرا چوونکە ڕۆمییەکان ئەویان ئەسیر کرد و فرۆشتیان. دەستەیەك دەڵێن: چوونکە سوورپێست بوو. ئەو لەهۆزی نەمیر کوڕی قاستە. پێش ئەوەی مناڵێکی بۆبێتە چوونکە، پێغەمبەر(د.خ) نازناوی باوکی یەحیایی پیٚ بەخشی. لەو کەسانە بو لەرێگەی خوادا ئەشکەنجە درا. ئەویان بەسەختی ئەشکەنجە کرد. کاتێك ویستی بۆ مەدینە کۆچ بکات قورەیشیکان رێگەیان لیٚ گرت. ئەو هەموو سامانی خۆی بەخشی و ئازادی خۆی کڕییەوە. کاتی مردنی عومەری خەتاب، فەرموی لەگەڵ خەڵکدا نوێژ بخوێنێت تا شەش راوێژکارەکە یەکێك بۆ جێگری هەڵبژێرن. ئەو لەشەوالی ساڵی ٣٨ کۆچی/٦٥٩ زایینی کۆچی دوایی کرد.

بەڵام عامر کوڕی فۆهەیرە، کۆیلەی توفەیل کوڕی عەبدوڵڵە ئەزدی بوو. توفەیل زڕبرای عایشە لەدایکیانەوە، دایکی ڕۆمان بوو. ئەو زۆر پێشتر لەڕۆشتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماڵی ئەرقەم باوەڕی هێنا. یەکێکە لەهەژارەکان کەلەرێگەی خوادا ئەشکەنجە کرا بەڵام لەدینەکەی هەڵنەگەڕایەوە. ئەبوبەکر کڕی و ئازادی کرد. ئەو مەڕەکانی ئەبوبەکری دەلەوەڕاند. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر لەئەشکەوتەکەدابوون، شەوانە مەڕەکانی دەبردە لای ئەوان تا لەشیرەکەی بخۆن. لەگەڵ ئەم دووانە بۆمەدینە کۆچی کرد و کارەکانی ئەوانی ئەنجام دەدا. لەشەڕ بەدر و ئوحود بەشدار و لەشەڕی بئرمەعونە لەچلٚ ساڵیدا کوژرا. کاتێك بەرم لێیاندا، وتی: سوێند بەخواوەندی کەعبە رزگارم بوو. لاشەکەی نەدۆزرایەوە تا

لەگەڵ کوژراوان بەخاکی بسپێرن. لەبەر ئەمە وتیان فریشتەکان ئەویان بەخاک سپاردووە.

یەکێتر لەئەشکەنجە دراوەکان باوکی فوکەیهە ئەفلەح یا یەسار بوو. ئەو کۆیلەی سەفوان کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف جومەحی بوو و لەگەڵ بیلال باوەڕی بەئیسلام هێنا. ئومەییە کوڕی خەلەف ئەوی گرت و تەنافێکی بەقاچییەوە بەست و فەرمانیدا بەسەر زەوی گەرمدا رایکێشن. لەم کاتەدا پشکلێك بەسەر زەویدا تلی دەخوارد. ئومەییە پێی وت: ئایا ئەمە خواکەت نییە.؟ باوکی فوکەیهە وتی: خوا، خواوەندی من و تۆ و ئەمەیە. ئومەییە تەنافەکەی بەتوندی لەقوڕگی گیرکرد و زەختی لێکرد. براکەی ئەبی کوڕی خەلەف لەوێ بوو و بەردەوام دەیوت: زیاتر ئەشکەنجەی بدە تا محەممەد بێت و بەجادووەکەی خۆی رزگاری بکات. ئەویان لەم حاڵەدا بەجێهێشت و گومانیان دەکرد مردووە. دواتر هاتە هۆش، ئەبوبەکر لایەوە تێپەڕی، کڕییەوە و دواتر ئازادی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: مناڵەکانی عەبدئەلدار ئەویان ئەشکەنجە دەکرد و کۆیلەی ئەوان بوو. تاشەبەردیان لەسەر سکی دادەنا تا زمانی لەقورگی بێتەدەر. بەڵام لەدینەکەی خۆی هەڵنەگەڕایەوە. باوکی فوکەیهە هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە کۆچی کرد و پێش شەڕی بەدر گیانی سپارد.

یەکێتر لەئەشکەنجە دراوەکان لەبیبە کەنیزی مناڵەکانی مۆمئێل کوڕی حەبیب کوڕی عودەی کوڕی کەعب بوو. ئەو پێش عومەر کوڕی خەتاب باوەڕی هێنا. عومەر ئەوی ئەشکەنجە دەکرد تا لەدینەکەی هەڵگەڕێتەوە و دواتر بەرەڵای دەکرد. پێی دەوت: هیلاك بوم کەدەستم لەئەشکەنجەدانت هەڵگرت و گەرنە دوبارە ئەشکەنجەم دەکردی. لەبیبە دەیوت: ئەگەر باوەڕ نەهێنی، تۆ لەو دنیا بەمشێوە ئەشکەنجە دەکەن. ئەبوبەکر ئەوی کڕی و ئازادی کرد.

یەکێتر لەئەشکەنجە دراوەکان، ژنێك بوبەناوی زونەیرە. ئەو کەنیزی مناڵەکانی عودەی بوو. عومەری خەتاب ئەوی ئەشکەنجە دەکرد. دەستەیەك دەڵێن: کەنیزی مناڵەکانی مەخزوم بوو. ئەبوجەهل ئەوەندەی ئەشکەنجە کرد تا کوێر بوو. ئەبوجەهل پێی وت: لات و عوزا ئەم کارەیان لەگەڵ تۆ کرد. ئەو وتی: لات و عوزا

چوزانن کێ ئەوان دەپەرەستێت؟ ئەمە کارێکی ئاسمانییە و خواکەی من دەتوانێت سۆمای چاوەکانم بۆ بگەڕێنێتەوە. کاتێك بەیانی بویەوە، خوا سۆمای چاوەکانی بۆ گەڕاندەوە. قورەیشییەکان وتیان: ئەمە جادووی محەممەدە. ئەبوبەکر ئەوی کڕی و ئازادی کرد.

هەروەها لەناو ئەوان ژنێك بوو بەناوی نەهدیە کەنیزی منداڵەکانی نەهد کەکەوتە دەستی ژنێك لەمنداڵەکانی عەبدئەلدار و باوەڕی هێنا. ژن ئەوی ئەشکەنجە دەکرد و دەیوت: سوێند بەخوا دەست لەتۆ هەڵناگرم تا یەکێك لەهاوەڵەکانی محەممەد بێت و تۆ بکڕێتەوە. ئەبوبەکر ئەوی کڕی و ئازادی کرد.

یەکیتر لەوان دایکی عوبەیس یا دایکی عونەیس کەکەنیزی منداڵەکانی زوهرە بوو. ئەسوەد کوڕی عەبد یەغوس ئەوی ئەشکەنجە دەکرد. ئەبوبەکر کڕی و ئازادی کرد.

ئەبوجەهل دەڕۆشتە لای یەکیەکی گەورەکان و دەیوت: ئایا دەستەبەرداری دینی خۆت و دینی باوکت دەبیت کەباشترن لەتۆ؟ ئەو بۆچوونی ئەوانی بەقێزەون لەقەڵەم دەدا و زانایی ئەوانی بەنەزانی هەژمار دەکرد و شەرەفی ئەوانی دەشکاند. ئەگەر بازرگان بوایە، دەیوت: بەزوویی کارەکەت و سامانەکەت لەدەست دەدەیت. ئەگەر ناتەوان بوایە، کەسانیتری دژی ئەو هان دەدا تا ئەشکەنجەی بکەن.

## ئەو کەسانەی پێغەمبەری خوایان ئازار دەدا

ئەوان دەستەیەك لەقورەیش بوون. لەوان: ئەبو لەهەب عەبدولعوزەی کوڕی عەبدولموتەلیب کەپیاوێکی دڵڕەق و ئازاردەری موسوڵمانەکان و پێغەمبەری(د.خ) ئازار دەدا. بەردەوام ئەوی بەدرۆزن لەقەڵەم دەدا و دەیڕەنجاند. ئەو پیسایی و شتە بۆن ناخۆشەکانی دەخستەماڵی پێغەمبەر(د.خ) چوونکە دراوسێی بوو. پێغەمبەر(د.خ) دەیوت: ئەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، ئەمە چۆن دراوسێیەتییەکە!

ڕۆژێك حەمزە ئەوی بینی و گوی هەڵگرت و لەسەری ئەبولەهەبی سوو. ئەبولەهەب گوی لەسەر و ڕیشی خۆی پاك دەکردەوە و دەیوت: هاوڕێکەی من

گوله!. ئەبولەهەب دەستی لەم کارەی هەڵگرت بەڵام کەسانیتری بۆ ئەو کارە هان دەدا.

ئەبولەهەب لەمەککە مرد و ئەمە لەکاتێکدا بو هەواڵی تێکشکانی بتپەرەستەکان لەشەڕی بەدری بەگوێ گەشت. ئەو بەنەخۆشییەکی تایبەت بەناوی (سورخەکان) ((جۆرە ئاوڵەیەك کەخەڵك بکوژێت)) مرد.

یەکیتریان ئەسوەد کوڕی عەبدیەغوس کوڕی وەهب کوڕی عەبد مەناف کوڕی زوهرە کوڕی پوری پێغەمبەر(د.خ) بوو. لەو کەسانە بوو گاڵتەیان بە پێغەمبەر(د.خ) دەکرد. هەرجار موسوڵمانێکی هەژاری دەبینی، دەیوت: ئەمانە پاشاکانی داهاتوونی سەرزەوین کەسامان و دارایی خوسرەوان بەمیرات دەبەن. بەپێغەمبەری دەوت: ئەی محەممەد، ئایا ئەمڕۆ لەئاسمانەوە قسەیان لەگەڵ نەکردیت؟ لەم قسانەی دەکرد.ئەو لەناو کەسەکانی خۆی هاتەدەر و لەرێگادا گیرۆدەی بایەکی ژەهراوی بوو و ڕووی ڕەش کرد. کاتێك بۆ لای ئەوان گەڕایەوە، نەیانناسییەوە و دەرگایان لێ نەکردەوە. سەرگەردان گەڕایەوە و لەتینواندا مرد. دەستەیەك دەڵێن: جبرەئیل ئەوی بینی و ئیشارەی بۆ ئاسمان کرد و خۆڕە کەوتە ناو جەستەی بەشێوەیەك لێوانلێو بوو لەچڵك و گیانی دا.

یەکیتر لەوان حارس کوڕی قەیس کوڕی عودەی کوڕی سەعد کوڕی سەهمی سەهمی بوو کەبەردەوام گاڵتەی بەپێغەمبەر(د.خ) و موسڵمانان دەکرد و پێغەمبەری(د.خ) ئازار دەدا. ئەو کوڕی غەیتەڵە بوو. غەیتەڵە دایکی بوو. ئەو بەردی هەڵدەگرت و دەیپەرەستی و کاتێك باشتری دەبینی، ئەوی فرێدەدا و ئەمی دەپەرستی. دەیوت: محەممەد هاورێکانی خۆی فریوداوە. ئەو موژدەی پێداون دوای مردن زیندوو دەبنەوە. سوێند بەخوا جگە لەسوڕانی رۆژگار هیچ نابێتە هۆکاری مردنی ئێمە. سەبارەت بەو بوو ئەم ئایەی هاتەخوار: ئایا ئەو پیاوەت نەبینی هەرسی خۆی کردە خوای خۆی و خوا لەڕووی زانست گومرایکرد و موڕی لەدڵ و گوێچکەیدا و پەردەی بەچاویدا کێشا. دوای خوا کێ ئەو ڕێنوێنی دەکات؟ ئایا پەند وەرنارگرن(جاثیە/٤٥/٢٣). ئەو ماسی خوێ لێدراوی خوارد و تینوویەتی زۆری بۆ هێنا و ئەوەندەی ئاو خواردەوە تا مرد. ئەو گیرۆدەی ئازاری قوڕگ ئێشە

بوو. ده‌سته‌یه‌ك ده‌ڵێن: سه‌ری پڕ بوو له‌چڵك و له‌ئازاری ئه‌وه گیانی دا.

یه‌كیتر له‌وان وه‌لید كوڕی موغه‌یره كوڕی عه‌بدوڵڵه كوڕی مه‌خزوم بوو. نازناوه‌كه‌ی باوكی عه‌بدشه‌مسه. ئه‌مه به‌مانای هاوتایه چوونكه ئه‌و هاوتای هه‌موو قوره‌یشییه‌كان بوو له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌موویان پێكه‌وه ماڵی كه‌عبه‌یان داده‌پۆشی و ئه‌و به‌ته‌نیایی ئه‌و كاره‌ی ده‌كرد. هه‌مان كه‌سو قوره‌یشی كۆكرده‌وه و وتی: خه‌ڵك له‌رۆژه‌كانی حه‌ج كردن دێنه لای ئێوه و له‌محه‌ممه‌د ده‌پرسن و ئێوه به‌شێوه‌ی جۆراوجۆر وه‌ڵام بده‌نه‌وه. یه‌ك بڵێت: جادووگه‌ره. یه‌كیتر بڵێت: كاهینه. ئه‌ویتر بڵێت: وتارده‌ره و ئه‌مه‌تان بڵێت: شێته. ئه‌مانه هاوتای یه‌ك نین. شیاوترین وته ئه‌وه‌یه بوترێت جادووگه‌ر چوونكه جیایی ده‌خاته نێوان پیاو و برا و ژنه‌كه‌ی. ئه‌بوجه‌هل وتی: ئه‌گه‌ر محه‌ممه‌د جوێن به‌خواكانی ئێمه بدات، جوێن به‌خواكه‌ی ده‌ده‌ین. خوا ئه‌م ئایه‌ی نارد: جوێن مه‌ده‌ن به‌و شتانه‌ی به‌خوایان ده‌زانن چوونكه ئه‌گه‌ری هه‌یه له‌ڕووی نه‌زانییه‌وه، جوێن به‌خوا بده‌ن. به‌مشێوه‌یه بۆ هه‌ر خه‌ڵكێك كاره‌كانی ئه‌وانمان ئاماده كرد و له‌نیگاكانیان جوانیمان ده‌رخست. گه‌ڕانه‌وه‌یان بۆ لای خوایه و ئه‌و كاته‌یه خوا ئه‌وان له‌چۆنییه‌تی كاره‌كانیان ئاگادار ده‌كاته‌وه(ئه‌نعام/١٠٨/٦). ئه‌و سێ مانگ دوای كۆچ كردن بۆ مه‌دینه مرد و له‌م كاته‌دا نه‌وه‌د وپێنج ساڵ ته‌مه‌نی بوو. ئه‌ویان له‌حه‌جون به‌خاك سپارد. ئه‌و لای پیاوێكی خوزاعه‌یی مرد كه‌تیری پڕ و تیژ ده‌كرد. قاچی خسته سه‌رتیر و قاچی بریندار بوو. پێشنیاری به‌منداڵه‌كانی كرد خوێنباییه‌كه‌ی له‌خوزاعه وه‌ربگرن. خوزاعییه‌كان خوێنبایی ئه‌ویاندا.

یه‌كیتر ئوبی و ئومه‌ییه كوڕه‌كانی خه‌له‌ف بوون. ئه‌م دووانه به‌خراپترین شێوه كه‌ده‌كرا، پێغه‌مبه‌ریان ئازار ده‌دا و ئه‌ویان به‌درۆزن ده‌زانی. ئوبی تیكه ئێسقانێكی ڕانی هێنایه لای پێغه‌مبه‌ر(د.خ) و به‌ده‌ستی له‌ت و په‌تی كرد و وتی: خوای تۆ گومان ده‌كات گیان ده‌كاته به‌ر ئه‌م ئێسقانه ڕزاوه؟ ئه‌م ئایه هاته‌خوار: بۆ ئێمه نمونه‌ی هێنایه‌وه( و ئافراندنی خۆی بیرچویه‌وه) و وتی: كێ ئێسقانی ڕزاو گیان ده‌به‌خشێت؟ بڵێ هه‌مان كه‌س زیندوو ده‌كاته‌وه كه له‌نه‌بوونه‌وه دروستی كرد و ئه‌و له‌هه‌ر ئافراندێك ئاگاداره (یس/٣٦/٧٨). عوقبه كوڕی ئه‌بی موعیت

خـواردنێکی ئامـادە و پێغەمبـەری بـانگکرد. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: نایەمـە سـەر سـفرەی تـۆ تـا شـایەتی بدەیت هـیچ خوایـەك جگـە لـەخوا نییـە. ئـەو ئەمـەی وت و پێغەمبـەر(د.خ) لەگـەڵ ئـەودا ڕۆشـت. ئومەییـە کـوڕی ئـەبی خەلـەف پێـی وت: ئایا ئەمـە و ئـەوەت وت؟ وتـی: ئـەوەم بـۆ خواردنەکـەمان وت. ئـەم ئایـە هاتـەخوار: ئـەو ڕۆژە بیربێنەرەوە کەزاڵم پەنجەکانی بەددان دەجوێت و دەڵێت: خۆزگـە مـن دەبوومـە هـاوڕێی پێغەمبـەر(د.خ) (فرقـان/٢٧/٢٥). ئومەییـە لەشـەڕی بـەدر کـوژرا و لەسـەر ناباوەڕی مـرد. ئـەو بەدەسـتی خوبـەیب و بیلال و بەوتـەی هەنـدێ کـەس بەدەسـتی ڕفاعە کوڕی ڕافعی ئەنساری کوژرا. براکەی ئوبی بەدەستی پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی ئوحود کوژرا بەم شێوە کەزوبینێکی بۆ هاویشت و ئەوی کوشت.

یـەکیتر لـەوان بـاوکی قـەیس کـوڕی فاکـە کـوڕی موغـەیرە بـوو. لـەو کەسـانە بـوو پێغەمبەری ئازار دەدا و بۆ ئازاردانی پێغەمبـەر(د.خ) هاوکاری ئەبوجـەهلی دەکرد. ئەو بدەستی حەمزە لەشەڕی بەدر کوژرا.

یـەکیتریان عاسـل کـوڕی وایلـی سـەهمی بـاوکی عـەمرۆ کـوڕی عـاس بـوو. لـەو کەسانە بوو گاڵتەیان بەپێغەمبەر(د.خ) دەکرد. کاتێك قاسم کـوڕی پێغەمبـەر(د.خ) مرد، وتی: محەممەد دوا بڕاوە چوونکە مناڵەکانی بەزیندوویی نامێننەوە. ئەم ئایە هاتەخوار: خراپەخوازەکەی تۆ دوابڕاوە(کوثر/١٠٨/٣). ئەو ڕۆژێك سـوار کەرەکـەی خـۆی بـوو و ڕوویکـردە دۆڵێـك لەکوێـستانی مەککـە، کەرکـەی خـەوت و خڕۆکێـك بەقاچییەوە دا. قاچـی ئاوسـا بەئەنـدازەی ملـی وشـترێك. ئـەو دوای کـۆچ کردنـی پێغەمبەر(د.خ) بۆمەدینە (لەدووەم مانگ دوای گەشتنی پێغەمبـەر(د.خ) بـۆ مەدینـە) لەهەشتا و پێنج ساڵیدا گیانی سپارد.

یەکیتر لەوان نەزر کوڕی حارس کوڕی عەلقیمە کوڕی کەلەدە کوڕی عەبد مـەناف کـوڕی عەبدئەلـداره. نازناوەکـەی بـاوکی قایـدە. لەهـەموو خـەڵکان زیـاتر پێغەمبـەر(د.خ) بـەدرۆزن دادەنـا و لەگـەڵ هاوڕێکـانی پێغەمبـەری ئـازار دەدا. ئـەو نوسراوی ئێرانییەکانی دەخوێندەوە و لەگەڵ یەهودی و مەسیحیەکان تێکەڵاو بوو. باسی پێغەمبەری بیست و زانی کاتی هاتنی ئەو نزیکە. لەبەر ئەمە وتـی: ئەگـەر ئێمە ئاگادارکەرەوەیەکمان هەبێت، دەبێت یەکێك بێت لـەم دوودەسـتە (ئێرانییـەکان

و رۆمـەکان). ئـەم ئایـە هاتـەخوار: ئەمانـە بـەدژوارترین سـوێندەکانی خۆیـان سوێندیان خـوارد کەئەگـەر نیـشانەیەك لەلایـەن خـواوە بـۆ ئـەوان بێـت، بـێ گومـان بـاوەڕی پێدەکـەن. بڵـێ: نیـشانەکان لەلایـەن خواوەیـە. و ئێـوە چـوزانن کاتێـك نیـشانەکان بـێن، ئـەوان بـاوەڕ نـاهێنن( انعـام/٦/١٠٩). ئـەو بـەردەوام دەیـوت: محەممەد ئەفسانەی پێشینان بۆ ئێوە باس دەکات. سەبارەت بەو چەندین ئایە هاتـەخوار. مقـداد لەشـەڕی بـەدر ئـەوی ئەسـیر کـرد و پێغەمبـەر(د.خ) فەرمانیـدا بکوژن. عـەلی کوڕی ئەبی تالیب لەشوێنێك بەناوی (ئەسیل) بەدەم ئەشکەنجەوە کوشتی.

یەکێتر لەوان ئەبوجەهل کوڕی هوشامی مەخزومی بوو کەزیاتر لەهەموو خەڵکان دوژمنایەتی پێغەمبەری کرد و زیاتر لەهەمووان پێغەمبەر(د.خ)و هاوەڵانی ئازاردا. ناوی عەمرۆ و نازناوەکەی ئەبوحەکەم بوو. موسوڵمانان ئەویان بەئەبوجەهل بانگ دەکرد. ئەو بوو سومەییە دایکی عـەمار کوڕی یاسری کوشت. هـەمووان کارەکانی ئـەو دەزانـن. ئـەو لەشـەڕی بـەدر کـوژرا. دوکوڕەکـەی عـەفرا ئـەویان دابەزەویـدا و عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود کوشتی.

مونەبە و نەبیـە کـوڕی حەجاجی سـەهمی لـەو کەسانە بوون پێغەمبـەریان ئـازار دەدا. ئەوان وەك هاورێکانی خۆیان، تانەیان لەپێغەمبەر(د.خ) دەدا و ئازاریان دەدا. ڕووبەڕووی پێغەمبـەر(د.خ) دەبونـەوە و دەیـانوت: ئایـا خـوا باشـتر لـەتۆ کەسـێکی نـەبینی بـۆ پێغەمبەرایـەتی بینێرێـت؟ لـەم شـارەدا کەسـانی بەتەمـەنتر و بـەتواناتر لـەتۆدەژین. مونەبـە بەدەسـتی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیـب لەشـەڕی بـەدر کـوژرا و کوڕەکەیشی عاس کوڕی مونەبە لەهـەمان شـەڕ بەدەسـتی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیب کوژرا. ئەو هەڵگری شمشێری زولفەقار بوو کەبە عەلی گەیشت. دەسـتەیەك دەڵێن: خاوەنی ئەم شمشێرە مونەبە کوڕی حەجاج یا نەبیە کوڕی حەجاج بوو.

یەکێتر لەوان زوهەیر کوڕی باوکی ئومەییە زڕ برای دایکی سەلمە بوو.

دایکی عاتیکە کچی عەبدولموتەلیب بوو. لەو کەسانە بوو بەئاشکرا پێغەمبـەری بـەدرۆزن نـاودەبرد و ئـەوەی پێغەمبـەر(د.خ) هێنـابوی، ڕەتـی دەکـردەوە و تانـەی لێدەدا بەلاّم لەهەمان کات لـەو کەسـانە بـوو بـۆ لـەناو بردنـی ئـەو پەیماننامـەی دژی

پێغەمبەر(د.خ) نوسرابوو، هەوڵی دەدا. سەبارەت بەمردنی ئەو گێرانەوەکان جیاوازن. دەستەیەك دەڵێن: ڕەوانەی شەڕی بەدر کرا و نەخۆش کەوت و مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەشەڕی بەدر ئەسیر کرا و پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد و کاتێك بۆ مەککە گەڕایەوە، مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەشەڕی ئوحود بەشداری کرد و تیری بەرکەوت و گیانیدا. دەستەیەك دەڵێن: دوای گرتنی مەککە بەدەستی پێغەمبەر(د.خ) بۆ یەمەن کۆچی کرد و لەسەر ناباوەڕی مرد.

یەکێتر لەوان باوکی وەلید عوقەبە کوڕی ئەبی موعیتی ئەبان کوڕی ئەبی عەمرۆ کوڕی ئومەییە کوڕی عەبد شەمس بوو. ئەو یەکێك لەئازاردەرترینی خەڵکان بۆ پێغەمبەری خوا و زیاتر لەهەمووان دوژمنایەتی پێغەمبەری دەکرد. ڕۆژێك خاکەنازێکی هەڵگرت و پڕی کرد لەپیسایی و خستیە بەردەم ماڵی پێغەمبەر(د.خ). تولەیب کوڕی عومەیر کوڕی وەهب کوڕی عەبد مەناف کوڕی قوسەی ئەو خاکەنازەی بینی و هەڵیگرت و هەردووگوێی عوقەبەی گرت و پیساییەکەی لەسەر و روخساری سوو. عوقەبە گلەیی و گازندەی بردە لای دایکی ئەو جوامێرە و وتی: کوڕەکەت باوەڕی بەمحەممەد هێناوە. ژن وتی: کێ لەمحەممەد شیاوترە بۆ ئێمە؟ سامان و گیانی ئێمە قوربانی محەممەد بێت. عوقەبە لەشەڕی بەدر ئەسیر کرا و بەئەشکەنجە کوژرا. عاسم کوڕی سابتی ئەنساری ئەوی کوشت. کاتێك ویستی بیکوژێت، وتی: ئەی محەممەد، چ پەناگا و هیوایەك بۆ منداڵەکانم بمێنێتەوە؟ وتی: ئاگری دۆزەخ. ئەو لەسەفرۀ یا عۆرقی ئەلزەبییە کوژرا و لەدار درا. ئەو یەکەم کەس بو لەئیسلامدا لەدار درا.

یەکێتر لەوان ئەسوەد کوڕی موتەلیب کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی قوسەی بوو. لەو کەسانە بوو گاڵتەیان بەپێغەمبەر(د.خ) دەکرد و بەئەبو زەمەعە ناودەبرا. ئەو هاورێکانی تانەیان لەپێغەمبەر(د.خ) دەدا و قسەی مانادارییان پێدەوت. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) و هاورێکانیان دەبینی، دەیانوت: ئەوا پاشاکانی سەرزەوی هاتن، ئەمانە دەبنە خاوەندەکانی گەنجەکانی خوسرەو و سزار. ئەوان بەدەم فیکەیان لێدەدا و بەدەست چەپڵە. پێغەمبەر(د.خ) داوای لەخوا کرد تا کوێری بکات و خەمی مردنی کوڕەکانی ببینێت. ڕۆژێك لەسێبەری دارێك دانیشت

و جبەرئیل هات و گەڵایەکی ئەو دارەی لەدەم و چاوی سوو و چقڵێکی کردە چاوی تــا کــوێر و لەپێغەمبــەر(د.خ) دورکەوتــەوە و ســەرقاڵی بەدبــەختی خــۆی بــوو. دەســتەیەك دەڵــێن: جبرەئیــل پەنجــەی بەچــاویدا کــرد و کــوێری کــرد. کوڕەکــەی لەشــەڕی بــەدر لەســەر ناباوەڕی کــوژرا. ئــەو بەدەســتی ئەبودوجانــە کــوژرا. کــوڕی کوڕەکــەی عوتــەیب، عــەلی و حــەمزە بــەهاوکاری یــەك کوشــتیان. کــوڕی کوڕەکــەی حــارس کــوڕی زەمەعــە کــوڕی ئەســوەد بەدەســتی عــەلی کــوژرا. دەڵــێن: ئــەو حــارس کوڕی ئەسوەد بوو. بەڵام وتاری یەکەم راستترە. ئەو بێژەری ئەمە بەیتەیە:

اتبکی ان تضل لها بعیر و یمنعها من النوم السهود

واتاکــەی: ئایــا ئــەو دولبــەرە نازەنینــە دەگریــت کەوشــترەکەی ون بــووە؟ ئایــا بەئاگایی ئەوی لەخەوی خۆش دورخستۆتەوە.

ئــەو لەکاتێکــدا مــرد خــەڵك خۆیــان بــۆ شــەڕی ئۆحــۆد ئامــادە دەکــرد و ئــەو خوانەناسانی بۆ شەڕ دژی پێغەمبەر(د.خ) هاندەدا.

یەکێتر لەوان تۆعەیمە کوڕی عودەی کوڕی نەوفل کوڕی عەبد مەناف بەنازناوی باوکی ڕیانە کەپێغەمبەری ئازار دەدا، جوێنی ناشیرینی پــێ دەوت، قسەی خراپــی دەکــرد و ئــەوی بــەدرۆزن لەقەڵــەم دەدا. لەشــەڕی بــەدر ئەســیر کــرا و حــەمزە ئــەوی بەئەشکەنجە کوشت.

یــەکێتر لــەوان مالــك کــوڕی تەلاتەڵــە کــوڕی عــەمرۆ کــوڕی غەبــشانە کەگاڵتــەی بەپێغەمبەر(د.خ) دەکرد. پێغەمبــەر(د.خ) نفرینی کــرد و جبرەئیــل پەنجــەی لەســەری چەقاند کەپڕ بو لەچڵك و لەتاو ئازارەکەی مرد.

ڕەکانــە کــوڕی یەزیــد کــوڕی هاشــم کــوڕی عەبدولموتــەلیب لــەو کەســانە بــوو دوژمنایەتییەکەی سەرسەختانەی لەگــەڵ پێغەمبــەر(د.خ) دەکــرد. ئەو بەپێغەمبــەری وت: قسەیەك لــەتۆ بــەرگوێم کــەوتووە و تــۆ درۆزن نیــت. ئەگــەر من لــەزەوی بدەیت، دەزانم کەتۆ راست دەکــەیت( کــەس نەیدەتوانی ئەو لــەزەوی بدات) پێغەمبــەر(د.خ) زۆرانــی لەگەڵدا گــرت و ســێ جــار ئــەوی لەزەویــدا. ئــەو کــات پێغەمبــەر(د.خ) داوای لێکــرد بــاوەڕ بێنێــت. وتــی: بــاوەڕ نــاهێنم تــا ئــەم دارە بــۆ لای خــۆت بــانگ نەکــەیت.

پێغەمبەر(د.خ) بەدارکەی فەرموو: وەرە پێش. دار هاتەپێش و بەردەوام زەوی هەڵدەکەند. ڕەکانە وتی: جادوویەکم لەمە گەورەتر نەبینیوە، فەرمان بدە تا بڕواتە شوێنکەی خۆی. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەدارەکەدا و دارەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی. ڕەکانە وتی: ئەمە جادوویەکی ئێجگار گەورەیە.

ئەوانەی ناویان برا، سەرسەختترین دوژمنەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون. گەورەکانیتری قوڕەیش دوژمنایەتییەکی کەمتریان نەبوو. ئەوان هاوشێوەی عوتەبە و شیبە و کەسانیتر بوون کەدوژمنایەتییان دەکرد بەڵام کەمتر ئازاریان دەدا. هەندێك لەقوڕەیشییەکان لەدوژمنترین دوژمنەکانی بوون و دواتر باوەڕیان هێنا. ئاماژەمان بەوان دا وەك: ئەبو سوفیان کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب، عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی ئومەییە مەخزومی( زڕبرای دایکی سەلمە و کوڕی عاتکە کچی عەبدولموتەلیب) ئەبوسوفیان کوڕی حەرب، حەکەم کوڕی ئەبی عاس باوکی مەروان و کەسانیتر کەلەڕۆژی گرتنی مەککە بەدەستی پێغەمبەر(د.خ) باوەڕیان پێی هێنا.

## کۆچ کردن بۆ سەرزەمینی حەبەشە

کاتێك پێغەمبەری خوا بینی هاوڕێکانی گرفتاری چ دەرد و ڕەنجێکن و ئەو لەبەر ڕووناکی بەخشینەکانی خوای گەورە ئارامی پێبڕاوە و ئەبوتالیبی مامی دەیپارێزێت بەڵام باوەڕدارانیتر گرفتاری ئەزموونی دژوارن و ناتوانێت زیاتر ئەوان بپارێزێت، پێشنیاری بەهاوڕێکانی خۆی کرد و وتی: ئەگەری هەیە باشتر بێت بۆ سەرزەمینی حەبەشە کۆچ بکەن چوونکە لەوێ پاشایەك هەیە ستەم لەهیچ کەسێك ناکات تا خوا کرانەوەیەك لەو گرفتارییانەی گیرۆدەی بوون، ئامادە بکات.

موسوڵمانان لەترسی گرفتاری و بۆ دەرباز کردنی دینەکەیان، بەرەو حەبەشە بەڕێکەوتن و ئەمە یەکەمین کۆچ بولەئیسلامدا. لەناو ئەو کەسانەی بۆ حەبەشە ڕۆشتن، عوسمان کوڕی عەففان و هاوسەکەری ڕوقییە کچی پێغەمبەر(د.خ) و باوکی حوزەیفە کوڕی عوتەبە کوڕی ڕەبیعە لەگەڵ هاوسەرەکەی سەهلە کچی

سوهەیل و زوبەیر کوڕی عەوام وکەسانیتر دەبینران کەدەگەشتنە دە یا یانزە پیاو و چوار ژنیان لەگەڵدا بوو. ڕۆشتنی ئەوان لەمانگی ڕەجەب لەپێنجەم ساڵی نێردرانی پێغەمبەر(د.خ) و دووەم ساڵ لەئاشکرا بوونی پێغەمبەرایەتییەکەی بوو. ئەوان مانگی ڕەمەزان و شەعبان لەوێ مانەوە.

کۆچکەران لەشەوالی پێنجەم ساڵی پێغەمبەری بۆ مەککە گەڕانەوە. هۆکاری گەڕانەوەیان بۆ مەککە ئەوە بوو پێغەمبەر(د.خ) بینی خەڵکەکەی زیاتر و زیاتر لێی دوردەکەونەوە و ئەم کارە لای ئەو دژوار و ئارەزوی کرد خوا شتێکی پێ ببەخشێت تا ببێتە هۆکاری نزیك بونەوەی ئەوان. ئەو بەردەوام لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد. لەم کاتەدا خوا ئەم سورەی نارد: سوێند دەخۆم بەئەستێرە کاتێك ئاوا دەبێت کەهاوڕێکەی ئێوە پێغەمبەر(د.خ) نەگومڕا بوو و نەبە لاڕێدا ڕۆشت (نجم/٥٣/١-٢). ئەو بەردەوام ئەم ئایانەی بۆ خەڵك دەخوێندەوە تا گەشتە ئەم ئایە: ئێستا ئایا لات و عوزا تان بینی؟ و مەنات کەیەکیترە و سێەمین، بینیتان؟ (نجم/٥٣/١٩-٢٠). لەم کاتەدا دێو ئەوەی لەدڵی پێغەمبەردا بوو و ئارەزوی دەکرد و لەوبارەوە قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد، خستە سەر زمانی و پێغەمبەر(د.خ) بەمشێوەی وت: (ئەو مەلە هەڵفڕە جوانانە، کەخوا بەنێوەنجیگەریان ڕازی بێت. قوڕەیشییەکان لەوتنی ئەم قسانە شادمان بوون و موسڵمانان ئەمەیان بەراست دەزانی چوونکە پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی دەوت و گومانی هەڵە وخەتای لێ نەدەکرا. کاتێك گەشتە کۆتایی سورەکە، سوجدەی پێویست هاتەخوار و پێغەمبەر(د.خ) سەری خستە سەرزەوی و نوێژی بۆ خوا کرد و موسڵمانان و بتپەرستان (جگە لەوەلید کوڕی موغەیرە کە لەبەر لەخۆبایی بوون، توانایی سەر خستنە سەرزەوی نەبوو) هەموویان سەریان خستە سەرزەوی و نوێژیان بۆ خوا کرد. وەلید کوڕی موغەیەر مشتێ خۆڵی هەڵگرت و لەناوچاوی خۆی سوو. ئەوسا خەڵك بڵاوەیان لێکرد. ئەم هەواڵە بەگوێی کۆچکەران گەیشت کەقوڕەیشییەکان باوەڕیان هێناوە. دەستەیەکیان گەڕانەوە و دەستەیەکیان مانەوە. جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەوی ئاگادار کردەوە کە چی هێناوەتە سەرزمان. پێغەمبەر(د.خ) خەمبار بوو و ترسا. خوا ئەم ئایەی نارد. پێش تۆ هیچ پێغەمبەر(د.خ) و نێردراوێکمان نەنارد جگە لەوەی کاتێك

ئارەزوی کرد، دێو خۆی خستە ناو ئارەزوەکەی. خوا دەیەوێت دێو لەناو بەرێت و ئەوسا نیشانەکانی خۆی ئاشکرا بکات و خوای زانا فرەزانە(حج/٢٢/٥٢). پێغەمبەر(د.خ) ترس و خەمی نەما.

قورەیشییەکان دووبارە موسوڵمانەکانیان ئازاردا و کاتێک موسوڵمانە کۆچکەرەکان گەشتنە نزیک مەککە، زانیان باوەڕهێنانی قورەیشییەکان شتێکی خەیاڵییە. هیچ کام لەوانە نەڕۆشتە ناو مەککە مەگەر بەنهێنی یا لەپەنای یەکێک لەبەهێزەکان. عوسمان کوڕی عەففان لەپەنای باوکی ئۆحەیحە سەعید کوڕی عاس کوڕی ئومەییە ڕۆشتە مەککە و لەوێ ئارامی گرت. باوکی حوزەیفە کوڕی عوتبە ڕۆشتە پەنای باوکی. عوسمان کوڕی مەزعون لەپەنای وەلید کوڕی موغەیرە جێگەی گرت و دواتر وتی: ئایا لەپەنای بتپەرەستێکدا بم؟ پەنا بردن بۆ خوا باشترە. ئەو لەپەنای وەلید کوڕی موغەیرە هاتەدەر. لوبەید کوڕی ڕەبیعە ئەم هۆنراوەی خۆی بۆ قورەیشییەکان خوێندەوە:

الا کل شیٔ ما خلا اللة باتل

واتاکەی: بزانن هەر شتێك جگە لەخوا فیڕۆیە.

عوسمان کوڕی مەزعون وتی: ئەمە ڕاستە و دروستە. لوبەید بەم شێوە درێژە بەقسەکەی خۆی دەدات:

و کل نعیم لا محالة زائل

واتاکەی: هەر بەخشینێکیش ناسەقامیگر و لەناوچوە.

عوسمان کوڕی مەزعون وتی: ئەمە قسەی قۆڕە چوونکە بەخشینەکانی بەهەشت هیچ کات لەناو ناچن و کەم ناکەن. لوبەید وتی: ئەی قورەیشییەکان، کۆڕەکانی ئێوە بەمشێوە نەبوو بەڵام خو و عادەتەکانی ئێوە لەسەر بنچینەی نەزانی بەهێزە. باسی بارودۆخی عوسمان و پەنا گرتن و پەشیمانبوونەوەی ئەویان کرد. یەکێك لەمناڵەکانی موغەیرە هەستا و مشتێکی لەچاوی عوسماندا. وەلید وەك سەرکۆنە کردن پێکەنی کە لەپەنای ئەو هاتەدەر. عوسمان وتی: تۆ دەبوا ئەمە بکەیت! عوسمان وتی: ئەمە چاوەی دیکەیشم پێویستی بەو مشتەیە. وەلید وتی: ئایا دەتەوێت جارێکیتر بێیتە پەنای من؟ وتی: جگە لەخوا پەنا بۆ کەس نابەم. سەعد

کوڕی وەقاس بەرەو ئەو کەسە هەستا کەمشتی لەچاوی عوسماندا. ئەو لوتی ئەو پیاوەی شکاند و ئەمە یەکەم خوێن بوو لەئیسلامدا ڕژا( بەشێوەیەك هەندێ کەس گومانی دەکەن.)

موسوڵمانان لەمەککە مانەوە و ئازاریان دەچێشت. کاتێك بارودۆخیان بەمشێوە بینی، جارێکیتر بۆ حەبەشە کۆچیان کرد. یەکەم کەس جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت و بەدوای ئەو موسوڵمانەکان ڕوویان لەحەبەشە کرد. لەحەبەشە هەشتا و سێ پیاو لەموسڵمانەکان کۆبونەوە. پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە مایەوە و بەردەوام بەنهێنی و ئاشکرا خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان بەئیسلام هاندەدا. کاتێك قوڕەیشییەکان زانیان دەستیان بەو ناگات، ئەویان بەجادووگەری و کاهینی و شێتی و وتاردەری لەقەڵەمدا. هەرکەس گومانی ئەوەی لێدەکرا گوێ لەوتەکانی ئەو بگرێت، دووریان دەخستەوە. دژواترین کار کەبەسەر ئەویاندا سەپاند، ئەوەیە عەبدوڵلە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاس ئامارەی پێدەدات و دەڵێت: ڕۆژێك قوڕەیشییەکان لەحیجر کۆبونەوە و باسی پێغەمبەریان کرد چۆن بەسەر دینەکەی ئەواندا زاڵبووە و ئەوان لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری دەکەن. لەم قسانەدا بوون لەناکاو پێغەمبەر(د.خ) دەرکەوت و سڵاوی بۆ روکن نارد و دواتر بەدەوری ماڵی خوادا سووڕایەوە و قوڕەیشییەکان قسەی توێکڵداریان پێ دەوت بەشێوەیەك بینیم کاریگەرییەکانی لەڕوخساریدا دەرکەوت. پێغەمبەر(د.خ) وەستا و وتی: ئەی قوڕەیشییەکان ئایا دەبیستن؟ سوێند بەو کەسەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، فەرمانی سەربڕینی ئێوەم هێناوە. ئەوان بەشێوەك بێدەنگ بون وەك بڵێی مەلەکان یەك یەك لەسەر سەریان نیشتبوونەوە و تەنانەت دوژمنترینیان بەو، بەنەرمی لەگەڵی دەدوا تا دوبارە پچڕانەکانی لەگەڵ ئەودا پەیوەند بکات. پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماڵ گەڕایەوە. بەیانی دووبارە ئەوان لەحیجر کۆبونەوە و بەیەکیان وت: ئامارەتان بەو هەموو زیانەدا لەئێوەی داوە و چۆن بەتوندی و ڕەقی لەگەڵ ئێوە قسەی کرد و وازتان لێهێنا. لەم قسانەدا بوون دوبارە پێغەمبەر(د.خ) دەرکەوت و ئەوان یەك دڵ و یەك زمان هێرشیان کردە سەری و پێیان وت: تۆ ئەو کەسەی ئەمە وئەوە دەڵێیت؟ وتی: من بووم ئەوەم وت. عوقبە کوڕی ئەبی موعیت داوێنی عاباکەی ئەوی گرت و

رایکێشا. ئەبوبەکر بۆ پارێزگاری کردن لەو هەستا و گریا و وتی: ئایا پیاوێك لەسزای ئەم کارەدا دەکوژن کەبڵێت: خواوەندەکەی من خوایە؟ (غافر/٢٨/٤٠).

## ناردنی قورەیشییەکان بەدوای موسڵمانە کۆچکەرەکان بۆ حەبەشە

کاتێك قورەیشییەکان بینیان کۆچکەران بۆ حەبەشە ئارام و ئاسودە بوون و نەجاشی رێگەی چاکەکاری لەگەڵ ئەوان گرتۆتەبەر، لەناو خۆیاندا راوێژیان کرد و عەمرۆ کوڕی عاس و عەبدوڵڵە کوڕی باوکی ئومەییەیان هاورێ لەگەڵ دیاری بۆ نەجاشی و سەرانی گەورەی دەربارەکەی بەرێکرد. ئەوان بەرەو حەبەشە بەرێکەوتن و دیارییەکانیان گەیاندە نەجاشی و سەرانی دەربارەکەی و وتیان: هەندێك لەنەزانەکانی خەڵکی ئێمە وازیان لەدینەکەی خۆیان هێناوە. ئەوان نەهاتوونەتە سەر دینی پاشا، بەڵکو دینێکی تازەیان بۆ خۆیان دروست کردووە کەنەئێمە دەیناسین و نەئێوە. ئێمە گەورکانی خۆمان بۆ لای ئێوە نارد تا ئەوانمان بۆ بگەرێننەوە. کاتێك ئێمە لەگەڵ پاشای دەربار گفتوگۆ دەکەین، ئێوەیش درێژە بەوتارەکەی ئێمە دبەن و پشتیوانمان بن و داوا لەپاشا بکەن پێش گفتوگۆ کردن لەگەڵ ئەوان، ئەوان بۆ ئێمە بگەرێنێتەوە. ترسان ئەگەر نەجاشی لەگەڵ موسڵمانەکان قسە بکات ئەوان تەسلیمی بتپەرستەکان نەکاتەوە. هاورێیانی نەجاشی بەڵێنی هاوکاریان بەقورەیشییەکان دا.

ئەوسا، ئەو دووپیاوە لەبەردەم نەجاشی ئامادەبوون و گفتوگۆیان لەگەڵ کرد. هاورێیانی نەجاشی وتیان: موسڵمانان تەسلیم بەقورەیشییەکان بکە. نەجاشی تورە بوو و وتی: نا، سوێند بەخوا ئەو کەسانەی پەنایان بۆ من هێناوە و لەولاتەکەی من نیشتەجێ بوون و منیان هەڵبژاردووە، تەسلیمی قورەیش ناکەم تا ئەوان بانگ بکەم و سەبارەت بەوتاری ئەم دووکەسە گفتوگۆیان لەگەڵ بکەم. ئەگەر وتاری ئەم دووانە راست بێت، موسڵمانان تەسلیمی ئەوان دەکەم و ئەگەر وتاری ئەوان راست بێت، پەنایان دەدەم و دەیانپارێزم و هاوسێیەتی ئەوان بەباشتر دەزانم.

دواتر نەجاشی کەسی بۆ لای هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) نارد. ئەوان ئامادە بوون.

موسوڵمانان بڕیاریندا جگە لەراستی هیچیتر نەهێننە سەر زمان چ نەجاشی پێی خۆش بێت چ ناخۆش. نوێنەری ئەوان بۆ قسە کردن جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب بوو. نەجاشی بەوانی وت: ئەم دینە چییە لەبەر ئەو وازتان لەدینی خەڵکەکەی خۆتان هێناوە و نەهاتوونەتە سەر دینی من یا دینێکیتر؟ جەعفەر وتی: ئەی پاشا، ئێمە خەڵکانێکی نەزان بوین و بتمان دەپەرستی، گۆشتی مردارەوبوومان دەخوارد، کاری ناشیرینمان دەکرد، پەیوەندییە خزمایەتییەکانمان دەپچڕاند و بەهێزەکان لاوازەکانیان ئازار دەدا تا ئەوەی خواوەند نێردراوێکی لەخۆمان بۆ ناردین کەنەژاد و بنەماڵە و راستی و دروستی و داوێنپاکی ئەو بەباشی دەناسین. ئەو، ئێمە بۆ تاقانە پەرەستی خواوەند هاندا تا بۆخوا شەریك دانەنێین، واز لەپەرەستنی بتەکان بێنین، پەیوەندی خزمایەتی ببەستین، رێزی دراوسێ بگرین، ئەمانەت دار بین، لەپەیوەندی ناڕەوان لەگەڵ ئەو ژنانەی بۆ ئێمە ناڕەوان دەست هەڵگرین، خوێن نەرێژین، کاری ناشیرین ئەنجام نەدەین، زۆرداری نەکەین، سامانی خەڵکان و هەتیوەکان نەخۆین، نوێژ بخوێنین و رۆژو بگرین. سەبارەت بەئیسلام روونکردنەوەی بەنەجاشیدا. جەعفەر وتی: ئێمە باوەڕمان پێ هێنا و بەراستگۆمان زانی و لەوەی بۆ ئێمەی بەناڕەوا زانی، دەستمان هەڵگرت و ئەوەی بەڕەوای زانی، ئەنجامماندا. ئەم خەڵکانە زۆرداریان بەسەر ئێمەوە کرد و ئەشکەنجەیان داین و زۆریان لێکردین دەست لەباوەڕەکەی خۆمان هەڵگرین و دووبارە بتەکان بپەرەستین. کاتێك ئێمەیان ئازاردا و ستەمیان لێکردین و لەنێوان ئێمە و ئایینەکەمان جیاییان دروست کرد، هاتینە ولاتەکەی ئێوە و ئێوەمان بەباشتر لەکەسانیتر زانی و هێوامان بەست، لەدەرباری ئێوە، ئەی پاشا، ستەممان لێ نەکرێت.

نەجاشی وتی: ئایا هیچ شتێك لەوەی لای خواوە هێناویەتی، پێیە؟ جەعفەر وتی: بەڵێ. جەعفەر دێرێکی (مریم /١/١٩) بۆ خوێندەوە. نەجاشی و قەشەکانی دەربار دەستیان بەگریان کرد. نەجاشی وتی: ئەم قسانە لەگەڵ قسەکانی عیسا، لەیەك چراوە نور دەپرژێنن. ئێوە دووانە دووركەونەوە کەهیچ کات ئەمانە تەسلیمی ئێوە ناکەم.

کاتێك ئەو دووانە لای نەجاشی هاتنەدەر، عەمرۆ کوڕی عاس وتی: سوێند بەخوا بەیانی وتارێکی وای بۆ دەخوێنمەوە، گوڵستانی موسوڵمانان بسوتێنێت. عەبدوڵڵە کوڕی ئومەییە کەخۆپارێزتر لەویتریان بوو، وتی: ئەو کارە مەکە ئەوان خزم و کەس و کاری ئێمەن.

کاتێك بەیانی بویەوە، ڕۆشتە لای نەجاشی و وتی: ئەم موسڵمانانە سەبارەت بەعیسا کوڕی مریەم قسەی ناڕەوا دەکەن. نەجاشی پەیك و پەیامی بۆ لای موسڵمانان نارد کەسەبارەت بەعیسا چی دەڵێن؟ جەعفەر هات و وتی: ئەوە دەڵێیت کە پێغەمبەرەکەمان پێی وتووین. ئەو بەندەی خوا، پێغەمبەری خوا، گیانی خوا و قسەی خوایە کەهاوسەری نەبینراوی بۆ مریەمی کچ دروست کرد. نەجاشی دارێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و وتی: عیسا لەوەی وتتان، لەباریکی ئەم دارە تێناپەڕێت. بەتریقەکان کەلەوێ بوون، لوتیان ئاوسان و توڕە بوون. نەجاشی وتی: هەرچەند توڕە بن. بەموسڵمانانی وت: بڕۆن کەپارێزراون. من حەز ناکەم خاوەنی کێوێکی زێڕین بم وبەبەهاکەی یەکێك لەئێوە ئازار بدەم. ئەو دیارییەکانی قوڕەیش دایەوە و وتی: خوا لەمن بەرتیلی وەرنەگرت تا من لەئێوەی وەربگرم، هەروەها سەبارەت بەمن قەسی خەڵکانی نەبیست تا من لەبەرابەر ئەو فەرمانبرداری خەڵکان بم. لەوەدوا موسڵمانان لەباشترین سەرزەمین نیشتەجێ بوون.

ئەوسا نەجاشی ڕووبەڕووی پاشایەك بویەوە کەلەسەر پاشایەتی شەڕی لەگەڵ کرد. ئەم کارە لای موسوڵمانەکان ناخۆش و گران بوو. نەجاشی بۆ شەڕ بەرێکەوت و موسڵمانەکان زوبەیر کوڕی عەوامیان ڕەوانە کرد تا بەسەرهاتی ئەوانیان بۆ بێنێت. کار بەشەڕ کۆتایی هات و نەجاشی سەرکەوت. موسوڵمانان لەهیچ هەواڵێك بەئەندازەی سەرکەوتنی ئەو خۆشحاڵ نەبوون.

ئەوەی وتی: خوا بەرتیلی لەمن وەرنەگرت، بیرخەرەوەی داستانێك بو بەمشێوەیە. باوکی نەجاشی جگە لەو منالی نەبوو. ئەو مامێکی بو دوانزە منالی بۆ هاتبوە دنیا. حەبەشییەکان وتیان: باشتر باوکی نەجاشی بکوژین و براکەی بکەین بەپاشا، ئەو جگە لەم کوڕە منالی نییە. براکەی ئەو و کوڕەکانی بۆ ماوەیەك پاشایەتیان لەناو خۆیاندا ئاڵوگۆڕ پێدەکرد. باوکی ئەویان کوشت و مامەکەیان

خستە سەرتەخت. نەجاشی لای مامی مایەوە. ئەو پیاوێکی فرەزان و بەڕێوەبردنی کارەکانی مامی گرتەدەست. حەبەشییەکان ترسان ئەوان لەسزای کوشتنی باوکی کوشتار بکات. بەمامیان وت: یا نەجاشی بکوژە یا لەئێمەی دوورخەرەوە چوونکە ئێمە لەو دەترسین. ئەو رازی بوو نەجاشی دووربخاتەوە هەرچەندە لەدڵەوە پێی خۆش نەبوو. ئەوان ڕۆشتنە بازار و بەشەسەد درەم بەبازرگانێکیان فرۆشت. بازرگان ئەوی سوار کەشتی کرد و بردی. کاتێك، ئێواریٚ داهات، هەورێك خرۆشا و هەورەبروسکە لەمامیدا. حەبەشییەکان ڕوویان لەمناڵەکانی کرد بەڵام بینیان هیچ کارێکیان پیٚ ناکرێت. کێشە لەناو حەبەشییەکان دروست بوو. هەندێك لەوان وتیان: سوێند بەخوا جگە لەنەجاشی کەس ناتوانێت ئێوە لەم گێژاوە دەربێنێت. ئەگەر هیواتان بەحەبەشە هەیە، ئەو بدۆزنەوە.

بەدوایدا گەڕان و دۆزییانەوە و هێنایان و کردیان بەپاشا. بازرگان هات و بەوانی وت: یادرمەکانم بۆ بگێڕنەوە یا لەگەڵ ئەو قسە دەکەم. وتیان: لەگەڵ ئەو قسە بکە. بازرگان وتی: ئەی پاشا، من کۆیلەیەکم بەشەشسەد درەم کری و دواتر فرۆشیاران هاتن و کۆیلەکەیان برد و پارکەیان نەدامەوە. نەجاشی بەحەبەشیەکانی وت: یا پارەکەی بۆ بگێڕنەوە یا کۆیلە دەست بخاتە ناو دەستی تا بۆ هەر شوێنێك دەیبات بیبات. ئەوان پارەکەیان بۆ گەڕاندەوە. ئەمە مانا و ناوەڕۆکی قسەکەی بو کەوتی(خوا بەرتیلی لەمن وەرنەگرت) و ئەمە یەکەم کار بوو لەدینداری و دادپەروەی ئەو بینرا.

دەڵێت: کاتێك نەجاشی مرد، تا ڕۆژگارێك لەگۆڕەکەی تیشك دەهاتەدەر.

## باوەڕهێنانی حەمزە

ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) لەسەفا دانیشتبوو کەئەبوجەهل لایەوە تێپەڕی. ئەوی ئازاردا و جوێنی پێدا و بەناشیرینی باسی کرد و دینەکەی سەرکۆنە کرد. کەنیزەکەی عەبدوڵڵە کوڕی جودعان لەماڵەکەی خۆی ئەمەی دەبیست. دواتر ئەبوجەهل لێی دوورکەوتەوە و لەکۆڕی قوڕەیشییەکان لەنزیك کەعبە دانیشت. ئەوەندەی نەخایاند حەمزە لەڕاو گەڕایەوە و کەوانەکەی کردبووە ملی. بەردەوام

کاتێك لەراو دەگەڕایەوە نەدەڕۆشتە لای ژن و منداڵەکەی خۆی تا بەدەوری کەعبەدا نەسوڕێت. لای کۆڕی قورەیشییەکانەوە تێپەڕی و سڵاوی لێکردن و لەگەڵ ئەوان گفتوگۆی کرد. ئەو لەهەموو قورەیشییەکان ڕێزدارتر، ئازاتر و بەشکۆتر بوو. کاتێك لای کەنیزەکەی عەبدوڵڵە کوڕی جودعان تێپەڕی ( و پێغەمبەر(د.خ) لەم کاتەدا گەڕابویەوە بۆ ماڵی خۆی) پێی وتی: ئەی باوکی عەمارە، ئەگەر ئەمڕۆ دەبویت و دەتبینی کوڕی براکەت لەدەست ئەبوحەکەم هوشام چی دەکێشا. جوێنی پێدا و ئازاریدا و دواتر ڕۆشت و محەممەد هیچی پێ نەوت. دەڵێت: کاتێك خوا دەیویست حەمزە بەڕێز بکات، ئەو تووڕە دەبوو. حەمزە بەپەلە ڕۆشت بەڵام بەهەمان شێوە کەلەکاتی سوڕان بەدەوری کەعبە لای کەس نەدەوەستا، خۆی ئامادەی شەڕ کردن لەگەڵ ئەبوجەهل کرد تا ڕووبەڕووی ببێتەوە و ڕقی خۆی بەسەرا خاڵی بکاتەوە. ئەو ڕۆشتە مزگەوت و ئەبوجەهلی بینی لەناو خەڵکدا دانیشتووە. ڕووی تێکرد و بەکەوان لەسەریدا و شکاندی و وتی: ئایا جوێن بەمحەممەد دەدەیت؟ من ئێستا لەسەر ئایینەکەی ئەوم. ئەگەر دەتوانی ڕووبەڕووی من ببەرەوە.

چەندین پیاو لەمنداڵەکانی نەخوزم هەستان تا بۆ هاوکاری ئەبوجەهل ڕووبەڕووی حەمزە ببنەوە. ئەبوجەهل وتی: وازی لێ بێنن، جوێنی ناشیرینم بەکوڕی براکەیدا. حەمزە باوەڕی بەئیسلام هێنا.

کاتێك حەمزە باوەڕی هێنا، قورەیشییەکان زانیان پێغەمبەر(د.خ) هێزی دەستکەوتووە و پارێزگاری لێدەکات. ئەوان ئازارەکانی خۆیان بۆ سەر پێغەمبەر(د.خ) کەم کردەوە.

ڕۆژێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کۆبونەوە و وتیان: هێشتا قورەیشییەکان قورئانیان بەدەنگی بەرز نەبیستوە. کێیە قورئان بەگوێی ئەوان بگەیەنێت؟ عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود وتی: من. وتیان: ترسمان لەتۆهەیە، کەسێکمان دەوێت بنەماڵەی هەبێت تاپارێزگاری لێ بکات. وتی: خوا پارێزگاریم لێ بکات. ئەو لەنیمەڕۆدا خۆی گەیاندە مەقام و قورەیشییەکان لەکۆڕەکانی خۆیان دانیشتبوون. عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود دەنگ خۆی بەرز کردەوە و دەستی بەخوێندنی سوردی (الرحمان) کرد. کاتێك قورەیشییەکان زانیان ئەو قورئان دەخوێنێت، ڕوویان تێکرد و لێیاندا

بەڵام ئەو بەردەوام قورئانی دەخوێند. دواتر بۆ لای هاورێکانی خۆی گەڕایەوە کەنیشانەکانی لێدان بەڕووخسارییەوە دیار بوو. وتیان: لەمە دەترساین. وتی: ئەمڕۆ دوژمنانی خوام لەهەمیشە بەلاوازتر بینی. ئەگەر بتانەوێت بەیانی ئەو کارە دووبارە دەکەمەوە. وتیان: بۆتۆ بەسە، ئەوەی نەیاندەویست بەگوێی ئەوانت گەیاند.

## باوەڕ هێنانی عومەر کوڕی خەتاب

دواتر عومەر کوڕی خەتاب باوەڕی هێنا و ئەمە لەدوای سی و نۆ پیاو و بیست و سیٚ ژن بوو. دەستەیەك دەڵێن لەدوای چل پیاو و یانزە ژن باوەڕی هێنا. پیاوێك بوو، چالاك، فرز، بوێر و پێگەبەرز. دوای کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ حەبەشە باوەڕی بەئیسلام هێنا. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) تا باوەڕ هێنانی عومەر بوێری ئەوەیان نەبو لای ماڵی خوا بەئاشکرا نوێژ بخوێنن. کاتێك ئەو باوەڕی هێنا، لەگەڵ قورەیشییەکان شەڕی کرد تا توانی لای ماڵی خوا نوێژ بخوێنێت. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەو نوێژیان خوێند.

پێش ئەو حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب باوەڕی هێنا و موسوڵمانان لەم دووانە هێزێکی تازەیان پیٚ بەخشرا و زانیان ئەم دووانە لەمەدوا پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان پارێزگاری دەکەن.

دایکی عەبدوڵڵە کچی باوکی حەسەمە هاوسەری عامر کوڕی رەبیعە دەڵێت: ئێمە دەمانویست بۆ سەرزەمینی حەبەشە کۆچ بکەین. عامر بەدوای کارێکدا رۆشتبویەدەر و عومەر کوڕی خەتاب هێشتا بتپەرەست بوو، روویکردە ئێمە و هاتە سەر سەرم و وەستا. ئێمە لەسەختگیری و ئازارەکانی ئەو رەنجی زۆرمان دەبرد. وتی: ئەی دایکی عەبدوڵڵە، ئایا دەڕۆن و ئێمە بەجێدێڵن؟ وتم: بەڵیٚ، سوێند بەخوا بیٚ گومان بەرەو سەرزەمینی پانی خوا دەڕۆین چوونکە ئێوە ئێمەتان ئازاردا و لەناوتان بردین، تا خوا چارەیەکمان بۆ دەدۆزێتەوە. عومەر وتی: خواتان لەگەڵ. بینیم دڵی نەرم بووە و خەمبارە. کاتێك عامر گەڕایەوە وتم: خۆزگە دەبویت و دەتبینی عومەر کوڕی خەتاب چۆن دڵنەرم و خەمبار بوو و بەزەیی بەئێمەدا

هاتەوە. هاوسەرکەم وتی: هیوا بەباوەڕ هێنانی ئەو بەست؟ وتم: بەڵێ. وتی: باوەڕ ناهێنێت تا کەرەکەی خەتاب باوەڕ دێنێت. ئەمەی لەبەر ئەوە وت چوونکە توندی و سەختگیری ئەوی بۆ سەر موسڵمانەکان بینیبوو. بەڵام خوای گەورە ئەوی ڕێنوێنی کرد و باوەڕی هێنا و لەسەر ناباوەڕان سەختی دەگرت.

هۆکاری باوەڕ هێنانەکەی ئەوەبوو خوشکەکەی، فاتیمە کچی خەتاب، هاوسەری سەعید کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی عودەی بوو و ئەم دووانە هەردووکیان موسوڵمان بوون و ئیسلامەتی خۆیان لەعومەر دەشاردەوە. نوعەیم کوڕی عەبدوڵڵە نەحامی عەدەوی باوەڕی هێنابوو و لەترسی کەسەکانی خۆی، باوەڕی خۆی دەشاردەوە. خەباب کوڕی ئەرەت لەهاوڕێ بەرێز و نزیکەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوو، بۆ لای فاتیمە هاتووچۆی دەکرد و قورئانی فێر دەکرد. ڕۆژێك عومەر شمشێری هەڵگرت و ڕۆشتەدەر و ئاهەنگی پێغەمبەر(د.خ) و موسوسڵمانانی کرد. موسوڵمانان لەماڵی ئەرقەم لەنزیك سەفا بوون. لەوانەی لەمەککە کۆچیان نەکردبوو، نزیکەی چل پیاو لەدەوری پێغەمبەر(د.خ) مابوونەوە. لەرێگا نوعەیم کوڕی عەبدوڵڵە چاوی بەعومەر کەوت وپێی وت: ئەی عومەر، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ وتی: دەڕۆم بۆ محەممەد کەژیانی لەقورەیشییەکان شێواندووە و بەردەوام سەرکۆنەی دینەکەی ئەوان دەکات. نوعەیم وتی: سوێند بەخوا شانازی بەخۆتەوە دەکەیت، ئایا گومان دەکەیت ئەگەر محەممەد بکوژیت منداڵەکانی عەبد مەناف تۆ بەزیندوویی دەهێڵنەوە تا لەسەر زەوی بەرێگاد بڕۆیت؟ بۆ ناڕۆیتە لای کەسەکانی خۆت و ئەوان دەمکوت ناکەیت؟ عومەر وتی: کام کەسانەی من؟ نوعەیم وتی: برای ژنەکەت و کوڕی مامت سەعید کوڕی زەید و خوشکەکەت فاتمە، سوێند بەخوا باوەڕیان بەئیسلام هێناوە.

عومەر بۆ لای ئەوان گەڕایەوە و بینی خەباب کوڕی ئەرەت لای ئەوانە و قورانیان فێردەکات. کاتێك دەنگی پێی عومەریان بیست، خەباب خۆی شاردەوە و فاتیمە گەڵاکەی هەڵگرت و لەژێر ڕانی خۆی شاردییەوە. عومەر ئاوازی قورئان خوێندنی خەبابی بیستبوو. کاتێك عومەر هاتە ناو، وتی: ئەم دەنگەدەنگە چییە؟ ئەو دووانە وتیان: هیچت بیست؟ عومەر وتی: بەڵێ. پێیان وتووم ئێوە دووانە باوەڕتان

بەمحەممەد هێناوە. عومەر هێرشی کردە سەر برای ژنەکەی و لێیدا. خوشکەکەی هەستا رێگەی لێ بگرێت. لەویشیدا و سەری شکا. کاتێك ئەمەی کرد خوشکەکەی پێی وت: ئێمە باوەڕمان هێناوە و باوەڕمان بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، هەرکارێك دەتەوێت بیکە.

کاتێك عومەر خوێنی بەسەر و چاوی خوشکەکەی بینی پەشیمان بویەوە و وتی: ئەمە گەلآیەی ئێستا دەتانخوێندەوە، بیدەن بەمن تا بزانم محەممەد چی هێناوە. خوشکەکەی وتی: دەترسم شتێکی لێبکەیت. عومەر سوێندی خوارد پێیان دەداتەوە. خوشکەکەی کەهیوای بەباوەڕ هێنانی بەستبوو، وتی: تۆ بتپەرەستی و ناپاکیت و ناپاکان دەست لەقورئان نادەن. عومەر هەستا و سەر و روخساری شۆرد. خوشکەکەی گەلآکەی پێدا تا قورئان بخوێنێت: طە. ئێمە قورئانمان بۆ تۆ نەنارد بەدبەخت ببیت. ئەمە تەنیا بیرخەرەوەیەکە بۆ ئەوەی لەخوا بترسێت.. نێردراوێك لەلایەن ئەو کەسەی ئاسمان و زەوییەکانی ئافراند. بەخشەرێك کە لەسەر تەخت ئارامی گرت. هی ئەوە ئەوەی لەئاسمان و زەویدایە و ئەوەی لەنێوان ئەم دووانەدایە وئەوەی لەژێر خاك شاراوەیە. ئەگەر دەنگی خۆت بەرزتر بکەیت، ئەو راز و ئەوەی لەراز شاراوەترە، دەزانێت. خوایەك جگە لەو خوا نییە و ئەو ناوە خاوەنی ناوە باشەکانە (طە/٢٠/١-٨). عومەر توانای نوسین و خوێندنەوەی بوو. بەردەوام ئەم ئایانەی دەخوێندەوە و دڵی نەرمتر دەبوو. کەماوەیەك خوێندییەوە، وتی: چەند ڕازاوە و وتەیەکی پاراوە! خەباب کەئەمەی بیست، هاتەدەر و وتی: ئەی عومەر، من هیوادرام خوا تۆی تایبەت کردبێت بۆ بانگەوازی پێغەمبەرەکەی چوونکە دوێنێکە لێم بیست دەیوت: ئەی خوایە، ئیسلام لای عومەر کوڕی خەتاب یا ئەبوئەلحەکەم هوشام بەهێز بکە. ئەی عومەر، خوایە! لەم کاتەدا عومەر وتی: ئەی خەباب من بەرە بۆ لای محەممەد تا بڕۆمە لای ئەو و باوەڕ بێنم. خەباب ئەوی رێنوێنی کرد. ئەو شمشێرەکەی هەڵگرت و ڕوویکردە ماڵی پێغەمبەر(د.خ) و هاورێکانی. هات و لەدەرگایدا. یەکیان هەستا و لەکەلێنی دەرگاکەوە سەیری کرد و عومەری بەشمشێری دەرکێشراو بینی و بەپێغەمبەری وت. حەمزە وتی: دەرگای بۆ بکەنەوە، ئەگەر بۆ کاری باشە هاتبێت، باشتر و گەرنە بەشمشێری خۆی

دەیکوژێن.

ئەو فەرمانیدا و عومەر ڕۆشتە ناو. پێغەمبەر(د.خ) بەخێرهاتنی کرد و لەبەری هەستا و هەردوولای عاباکەی گرت و وتی: بۆ چ کارێك هاتوویت؟ گومان دەکەم تا ڕەنجێکی گران لەلایەن خواوە بەسەر تۆدا نەبارێت، بیرناکەیتەوە. عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتووم باوەڕ بەخوا وپێغەمبەرەکەی بێنم. پێغەمبەر(د.خ) بەدەنگی بەرز وتی: خوا گەورەیە. ئەوەندە بەرز وتی هەموو ئەو کەسانەی لەماڵی خوادابون بیستیان و زانیان عومەر باوەڕی بەئیسلام هێناوە. کاتێك باوەڕی هێنا، وتی: کام یەك لەقوڕەیشییەکان خێراتر لەهەمووان هەواڵەکان لەناو خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە؟ وتیان: جەمیل کوڕی مەعمەری جومەحی.عومەر ڕۆشتە لای و ئەوی لەباوەڕ هێنانی خۆی ئاگادار کردەوە. ئەو بەرەو مزگەوت ڕۆشت و عومەر بەدوایەوە بوو. جەمیل هاواری دەکرد: ئەی قوڕەیشییەکان، ئاگاداربن عومەر کوڕی خەتاب ڕێگەی مناڵانی گرتەبەر. عومەر هاواری دەکرد: درۆ دەکات من باوەڕم بەئیسلام هێناوە. ئەوان هەستان و پەلاماری یەکیاندا. شەڕیان کرد تا خۆی خۆی شاردەوە و هیلاك بوو. دانیشت و ئەوان لەسەر سەری بوون. عومەر وتی: هەرچیتان دەوێت بیکەن. ئەگەر ئێمە سێسەد پیاو دەبوین، کارێکمان دەکرد ئێوە شاری مەککەمان بۆ چۆڵ بکەن یا ئێمە بۆ ئێوەی چۆڵ بکەین.

ئەوان لەم بگرە و بێنەدا بون پیرەپیاوێك ڕووی تێکردن و وتی: ئێوە چیتان لێ بەسەردێت؟ وتیان: عومەر کوڕی خەتاب ڕێگەی مناڵانی گرتۆتەبەر. پیرپیاو وتی: بێدەنگ بن، وازی لێبێنن. پیاوێکە ڕێگەیەکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئایا گومان دەکەن مناڵەکانی عودەی بەئاسانی لێتان خۆش دەبن؟ ئەم پیاوە عاس کوڕی وایل بوو. عومەر دەڵێت کاتێك باوەڕم هێنا، ڕۆشتمەماڵی ئەبوجەهل و لەدەرگامدا. هاتەدەر و وتی: بەخێربێیت، کوڕی براکەم، بۆ هاتوویت بۆ ئێرە؟ وتم: هاتووم ئاگادارت بکەمەوە باوەڕم بەئیسلام هێناوە و شوێن محەممەد کەوتوم و ئەوەی ئەو باسی دەکات بەراستی دەزانم. دەرگاکەکەی بەتوندی پێوەدا و وتی: خوا تۆ و ئەوەی هێناوتە، قێزەون بکات! سەبارەت بەباوەڕهێنانی ئەو ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە.

## داستانی پەیمان نامە

کاتێك قورەیشییەکان بینیان ئیسلام فراوان و بەهێز دەبێت وموسولمانەکان بەباوەڕهێنانی عومەر کوڕی خەتاب و حەمزە چاونەترس بوون و عەمرۆ کوڕی عاس و عەبدوڵلە کوڕی ئومەییە هەواڵیان سەبارەت بەپارێزگاری کردنی نەجاشی لەموسولمانەکان لەحەبەشە هێناوە کەهۆکارێکە بۆ ڕەنج و شکانی ئەوان، راوێژیان کرد تا لەنێوان خۆیان نامەیەك بنوسن تا هیچ ژنێك لەمناڵەکانی هاشم نەکەنە هاوسەری خۆیان و هەروەها ژن بەوان نەدەن و هیچیان پێ نەفرۆشن هیچیان لێ نەکڕن. لەمبارەوە نامەیەکیان نوسی و هاوپەیمان بوون و ئەوکاتە، نامەکەیان بەکەعبەوە هەڵواسی تا هۆکارێك بێت بۆبەهێزی پەیمانەکە و ئەوانی پێ پێبەند بکات. کاتێك قورەیشییەکان ئەمەیان کرد، مناڵەکانی هاشم و مناڵەکانی عەبدولموتەلب ڕوویان لەئەبوتالیب کرد و پەیوەستی بوون و هاوڕێ لەگەڵ ئەو ڕۆشتنە ناو دۆڵێك و کۆبونەوە.

ئەبولەهەب لەڕیزی مناڵەوکانی عەبدولموتەلیب ڕۆشتەدەر و چووە ریزی قورەیشییەکان و لەرێگا هند کچی عوتەبەی بینی. پێی وت: هاوکاری کردنی من بۆ لات و عوزا چۆن بینی؟ هند وتی: کارێکی باشت کرد. موسولمانان دوو یا سێ ساڵ بەمشێوە مانەوە و گیرۆدەی رەنجێکی زۆر بوون و جگە بەنهێنی هیچ شتێکیان پێ نەدەگەیشت.

دەڵێن: ئەبوجەهل رۆژێك حەکیم کوڕی حیزام کوڕی خوەیلدی بەهەمانێکی پڕ گەنمەوە بینی، دەیبرد بۆ پوری خۆی خەدیجە و ئەم خاتوونە لەم کاتەدا لای پێغەمبەر(د.خ) و لەدۆڵەکە ژیانی بەسەر دەبرد. ئەبوجەهل رێگەی لێگرت و وتی: سوێند بەخوا، رێگە نادەم یەك هەنگاو بڕۆیتە پێش و ریسوات دەکەم. ئەبوبەختەرەی کوڕی هوشام هات و وتی: چیت لەو دەوێت؟ بڕێك خواردنی هەڵگرتووە بیبات بۆ پوری. ئایا دەتەوێت رێگەی لێ بگریت؟ لەسەر رێگاکەی لاچۆ. ئەبوجەهل رازی نەبو و جوێنی پێدا. ئەبوبەختەری شەویلاکی وشترێکی هەڵگرت و کێشای بەسەریدا و خوێناوی کرد و لێیدا. حەمزە سەیری دەکردن.

ئەوان نەیاندەویست ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر(د.خ) بگات و ئەبوجەهل بتوانێت لەم ڕێگاوە پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانەکان سەرکۆنە بکات. پێغەمبەر(د.خ) بەنیهێنی و ئاشکرا خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان هاندەدا و بەردەوام وەحی بۆ دەهات بێ پچڕان. ئەوان سێ ساڵ بەو شێوەیە مانەوە.

دەستەیەك لەقوڕەیشییەکان بۆ شکاندنی ئەو پەیمان نامەیە هەستان. ئەوەی تاقی کردنەوەیەکی باشتری لەهەمووان نیشاندا، هوشام کوڕی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی لۆئەی برازای (لەدایکەوە) هوشام کوڕی عەبد مەناف بوو. ئەو وشترێکی بارقورسی خواردن هەڵدەگرت وشەوان دەڕۆشتە دۆڵەکەی ئەبوتالیب و جڵەوی وشترەکەی دەبرد و دەڕۆشتە ناو دۆڵەکە. کاتێك بارودۆخی ئەوانی لەوێ بینی و زانی کات لەسەر ئەوان درێژ بۆتەوە، ڕۆشتە لای زوهەیر کوڕی ئەبیی ئومەییە کوڕی موغەیرەی مەخزمی برای دایکی سەلمە کەئەویش زۆر لایەنگری لەپێغەمبەر(د.خ) دەکرد. دایکی کچی عەبدولموتەلیب بوو. پێی وت: ئەی زوهەیر، ئایا بەمە رازی دەبیت، خواردن بخۆیت و جل و بەرگ بپۆشیت ولەگەڵ ژنان جوت بیت و خاڵەکانت بەو شێوە بن کەدەیانبینیت؟ من بەخوا سوێند دەخۆم ئەگەر ئەمانە خاڵی ئەبوجەهل دەبوون و ئەوسا تۆ داوای ئاوا کارێکت لێ بکردایە، هیچ کات رازی نەدەبوو. زوهەیر وتی: دەتوانم چی بکەم؟ پیاوێکی تەنیام. سوێند بەخوا ئەگەر پیاوێکیترم لەگەڵ بێت ئەم پەیمانە دەشکێنم. هوشام وتی: پیاوێکیتر لەپشتی تۆیە. وتی: کێیە؟ وتی: منم. زوهەیر وتی: بەدوای سێیەم کەسدا بگەڕێ. ئەو ڕۆشتە لای موتعیم کوڕی عودەی کوڕی نەوفل کوڕی عەبد مەناف و وتی: ئایا بەمە رازی دەبیت دوو بنەماڵە لەمناڵەکانی عودەی و مناڵەکانی مەناف لەناو بچن و تۆ شایەتی ئەم کارە بیت وپێی رازی؟ سوێند بەخوا ئەگەر دەستی ئەوان لەم جۆرە کارانەدا کراوەبێت، ئەوان لەئازاردانی خۆتاندا دەبیننەوە. موتعیم وتی: دەتوانم چی بکەم؟ من پیاوێکی تەنیام. وتی: کەسی دووەم لەپشتی تۆیە. وتی: کێیە؟ وتی: من. وتی: بەدوای سێیەم کەسدا بگەڕێ. وتی: گەڕاوم. وتی: کێیە؟ وتی: زوهەیر کوڕی باوکی ئومەییە. وتی: بەدوای چوارەم کەسدا بگەڕێ. ئەو ڕۆشتە لای ئەبوبەختەری و هەمان قسەی پێ وت. ئەبوبەختەری وتی: ئایا بۆ ئەم کارە پشت و

هاوکارمان هەیە؟ وتی: بەڵێ. وتی: کێیە؟ وتی: من و زوهەیر و موتعیم. وتی: بەدوای پێنجەم کەسدا بگەڕێ. ئەو ڕۆشتە لای زەمەعە کوڕی ئەسوەد کوڕی موتەلیب کوڕی ئەسەد و لەگەڵ ئەو قسەی کرد وخزم وکەسوکارەکەی بیرخستەوە. زەمەعە وتی: ئایا بۆ ئەم کارە هاوکارمان هەیە؟ وتی: بەڵێ. ئەو ناوی ئەو چەند پیاوەی برد. ئەوان لەشوێنێك بەناوی (خەتەم ئەلحەجون) لەسەرووی مەککە کۆبونەوە و سوێندیان خوارد پەیمان نامەکە بشکێنن. زوهەیر وتی: من دەست بەم کارە دەکەم.

کاتێك بەیانی بویەوە، ئەوان بەرەو شوێنی کۆبونەوەکانی خۆیان ڕۆشتن. زوهەیریش هات و بەدەوری ماڵی خوادا سوڕایەوە و ئەوسا ڕوویکردە خەڵکان و وتی: ئەی خەڵکانی مەککە، ئایا ئەمە ڕەوایە ئێمە بخۆین و بپۆشین و منداڵەکانی هاشم بەرەو لەناوچوون بڕۆن و نەتوانن لەکەس شت بکڕن و کەس نەتوانێت شت بەوان بفرۆشێت؟ سوێند بەخوا دانانیشم تا ئەم پەیمان نامە زاڵمانە هەڵدوەشێتەوە. زەمەعە کوڕی ئەسوەد وتی: سوێند بەخوا تۆ درۆزنتریت. کاتێك نوسرا، ئێمە پێی ڕازی نەبوین. ئەبوبەختەری وتی: زەمەعە ڕاست دەکات. ئێمە پێی ڕازی نابین و لەسەرەتاوە پێی ڕازی نەبووین. موتعیم کوڕی عودەی وتی: ئێوە دووانە ڕاستتان کرد، هەرکەس جگە لەمە بڵێت، درۆ دەکات. هوشام کوڕی عەمرۆ هاوشێوەی ئەم قسانەی کرد. ئەبوجەهل وتی: ئەمە کارێك بو لەیەك شەودا ئەنجام درا و ئەبوتالیب لەو کاتە لای مزگەوت دانیشتبوو.

موتعیم کوڕی عودەی هەستا و ڕۆشت و دەستی بۆ پەیماننامەکە برد تا بیدڕێنێت بەلاّم بینی مۆریانە خواردوویەتی، جگە لەو بەشە کەنوسرابو (بەناوی تۆ ئەی خوا). ئەم ڕستەیان لەسەرەتای نامەکانی خۆیان دەنوسی. نوسەری پەیمانەکە مەنسور کوڕی عێکرەمە بوو کە دەستی ئیفلیج بوو.

هۆکاری هاتنەدەرەوەی ئەوان لەدۆڵەکە ئەوەبوو، کاتێك پەیماننامەکە نوسرا و لەماڵی خوا هەڵواسرا، خەڵك لەمناڵەکانی هاشم و عەبدولموتەلیب دوورکەوتنەوە. پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوتالیب و هاورێکانیان بۆ ماوەی سێ ساڵ لەدۆڵەکەدا مانەوە و لەم ماوەدا خوا مۆریانەکانی نارد و پەیماننامەکەیان خوارد و ناوی خوای

گەورەیان وەك خۆی هێشتەوە. جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەوی لەم کارە ئاگادار کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەم هەواڵەی بەمامەی ئەبوتالیب وت و ئەبوتالیب لەراستی وتەکانی ئەو گومانی نەبوو. ئەو لەدۆڵەکە هاتەخوار و ڕۆشتە ماڵی خوا. قورەیشییەکان کۆبونەوە و ئەبوتالیب بەوانی وت: کوڕی براکەم منی ئاگادار کردەوە کەمۆریانە پەیمان نامەکەی خواردوە و ناوی خوای گەورەی بەجێ هێشتووە. پەیماننامەکە بێنن، ئەگەر وتەکانی ڕاست بێت بزانن ئێوە ستەمکار و پچڕێنەری پەیوەندی خزمایەتین و ئەگەر وتەکانی درۆ بێت دەزانین کەئێوە ڕاست دەکەن و ئێمە لەرێ دەرچوانین.

ئەوان بەپەلە هەستان و پەیماننامەکەیان هێنا و بەهەمان شێوەیان بینی کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمووبووی. گیانی ئەبوتالیب بەهێز و دەنگی بەرز. وتی: ئێستا بۆتان ڕوونبویەوە ئێوە ستەمکار وپچڕێنەری پەیوەندی خزمایەتین. ئەوان سەریان داخست و دواتر وتیان: تۆ جادوو بۆ ئێمە دەهێنیت و بەدرۆ تاوانبارمان دەکەیت. ئەو کاتە وەك ئاماژەمان پێدا چەند کەسێك پەیماننامەکەیان شکاند. ئەبوتالیب سەبارەت بەو پەیماننامەیە هۆنراوەیەکی هۆنیوەتەوە کەچەند دێرێکی بەمشێوەیە:

وقد كان في امر الصحيفة عبرة ... متى ما يخبر غايب القوم يعجب
محا الله منهم كفرهم و عقوقهم ... و ما نقموا من ناطق الحق معرب
فاصبح ما قالوا من الامر باطلاً ... و من يختلق ما ليس بالحق يكذب

واتاکەی: لەو پەیماننامەیەدا ئامۆژگاریەك شاراوە بوو کەئەگەر بۆ بەشدار نەبووان لەوکۆڕەی باس بکەن، سەریان سوڕدەمێنێت. خوا ناباوەڕی و ناسپاسی و ستەمی ئەوانی بۆ سەر خزمەکانیان نەهێشت و ئەو ڕقەی لەبێژەری ڕاستی و دروستی و ئاشکراکەری هەڵیان بەستبوو، لەناو برد. کاتێك بەیان داهات، ئەو هەموو ناڕاستییەی وتبوویان، بووە شتێکی هیچ، هەر کەس جگە لەرێگەی ڕاستی و دروستی ببڕێت، زمان بەدرۆزنی دەرازێنێتەوە.

## مردنی ئەبوتالیب و خەدیجە و بانگەوازی پێغەمبەر(د.خ)

ئەبو تالیب و خەدیجە سێ ساڵ پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە کۆچی دواییان کرد. ئەمە دوای گەڕانەوەیان لەدۆڵەکە بوو. ئەبوتالیب لەشەوال یا زیقەعدە لەتەمەنی هەشتا و چەند ساڵیدا مرد. خەدیجە سی وپێنج یا پەنجا و پێنج رۆژ پێش ئەو مرد. هەندێك دەڵێن: سێ رۆژ پێشتر مرد. داخی مردنی ئەوان و داخی دروست بوو لەمردنی ئەوان، بۆ پێغەمبەر(د.خ) دژوار بوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قورەیشییەکان پێش مردنی ئەبوتالیب نەیانتوانی ئازار بەمن بگەیێنن کەلێی بڕەنجێم. قورەیشییەکان دوای مردنی ئەبوتالیب، زیان و ئازاریان بە پێغەمبەر(د.خ) گەیاند کەپێش مردنی ئەو بوێری ئەو کارەیان نەبوو. تەنانەت هەندێك لەوان خۆڵیان دەکرد بەسەر و روخساریدا و هەندێکیتر لەکاتی نوێژ ریخۆڵەی مەڕیان دەکرد بەسەریدا. پێغەمبەر(د.خ) دەیکرد بەسەری دارێکەوە و دەیوت: ئەی منداڵەکانی عەبد مەناف ئەمە چۆن دراوسێیەتییەکە! دواتر لەرێگادا فڕیدەدا.

کاتێك دوای مردنی ئەبوتالیب بارودۆخ بۆ ئەو دژوار و دژواتر بوو، لەگەڵ زەید کوڕی حارسە بەرەو سەقیف ڕۆشتەدەر و داوای هاوکاری لەسەقەفییەکان کرد. کاتێك گەشتە سەرزەمینی ئەوان، ویستی بڕواتە لای سیان لەوان کە لەورۆژەدا سێ سەرۆکەکەی سەقیف و برای یەکتر بوون. عەبد یا لەیل و مەسعود و حەبیب منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عومەیر. ئەو بۆ باوەڕ هێنان هانیدان و لەگەڵ ئەوان گفتوگۆی کرد تا هاوکاری ئیسلام بکەن و دژی نەیارانی شەڕ بکەن. یەکێك لەوان وتی: دێوێکی سەرکێش بۆ فڕاندنی پەردەی کەعبەیت ئەگەر خوا تۆی بۆ پێغەمبەری ناردبێت! یەکیتریان وتی: ئایا خوا جگە لەتۆ کەسی دەست نەکەوت وەك پێغەمبەر(د.خ) بینێرێت! سێیەمی وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ تۆ قسە ناکەم. ئەگەر بەو شێوە بێت کەدەڵێیت پێغەمبەرێك نێردراو لەلایەن خواوە بیت، دەبێت زیرەکتر لەوە بیت پێویستت بەوەڵامی من هەبێت و ئەگەر درۆ بەدەم خواوە ببەستێت، شیاوی ئەوە نیت لەگەڵت بدوێم.

پێغەمبەر(د.خ) لەچاکەی سەقیفییەکان بێ هیوا بوو و پێی وتن: ئەگەر هەنگاو بۆ هاوکاری کردنی من هەڵناگرن، لانی کەم ئەمە وەك نهێنی لای خۆتان بهێڵنەوە. پێغەمبەر(د.خ) ترسا ئەم هەواڵە بەخەڵکەکەی بگات. ئەوان بەداواکەی رازی نەبوون و نەزانەکانیان دژی ئەو هاندا. سەرسەرییەکان دەوریان دەگرت و ئازاریان دەدا و ئەویان بۆ بێستانەکانی عوتەیبە و شیبە دوورخستەوە کەهەردووکیان لەناو بێستانەکەدا بوون. سەرسەرییەکان بلاوەیان لێکرد و دەوری ئەویان چۆڵ کرد. ئەو لەژێر سێبەری دار خورمایەك ئارامی گرت و وتی: ئەی خوایە! لاوازە هێزم، بێ دەرەتانم و سوکیم لای خەڵکەکەم لای تۆ باس دەکەم و گلەیی دەست پێدەکەم. ئەی خوایە! ئەی مێهرەبانترین مێهرەبانان، ئەی خواوەندی هەژاران، من بەکێ دەسپێریت؟ بەدوژمنێك کەهێرشم بکاتە سەر یا بێگانەیەك دەست درێژیم بۆ سەر بکات؟ لەگەڵ ئەمەیشدا ئەگەر تورە نەبیت، ترسم نییە. بەلام ئاسودەیی بارەگایی تۆ، بەربلاوتر لەمانەیە. من بۆ رووناکی روخساری تۆ کەرووناکییەکانی پێ رۆشن بۆتەوە و کاری ئەم دنیا و ئەو دنیایی باش کردووە، پەنا دەبەم کەتورەیی تۆ بەسەر مندا بێتەخوار یا نەویستی تۆ داوێنم بگرێت.

کاتێك کورەکانی رەبیعە بینیان چی بەسەر هاتووە، بەزەییان پیای هاتەوە و کۆیلە مەسیحیەکەی خۆیان بەناوی عەداس بانگ کرد و وتیان: بۆڵە ترێیەك هەڵگرە و بیبە بۆ ئەو پیاوە. ئەو کارەی کرد و کاتێك بۆڵە ترێکەی لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) دانا، دەستی بۆ برد و وتی: بەناوی خوای گەورە و میهرەبان. ئەوسا بۆڵە ترێکەی خوارد. عەداس وتی: سوێند بەخوا ئەم قسەیە بۆ خەڵکی ئەم شارە نامۆیە. پێغەمبەر(د.خ) پرسی: خەڵکی کوێیت و لەسەر چ ئایینێکیت؟ عەداس وتی: مەسیحیم و خەڵکی نەینەوا. پێغەمبەر(د.خ) پرسی: لەدێهاتی ئەو بەندە شیاوەی خوا یونس کوری مەتا؟ عەداس وتی: لەکوێوە دەزانی یونس بوو؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەو پێغەمبەر و برای من بوو، منیش پێغەمبەرم. عەداس کەوتە سەر دەست و پێی پێغەمبەر(د.خ) و ماچی کرد.

لەم کاتەدا یەکێك لەدوو کورەکەی رەبیعە بەویتری وت: کۆیلەکەتی لەرێ بەدەر کرد. کاتێك عەداس گەرایەوە، ئەو دووانە پێیان وت: هاوار لەتۆ، بۆ دەست وپێی

ئەو پیاوەت ماچ کرد؟ عەداس وتی: لەسەر زەوی کەس باشتر لەم پیاوە نییە. ئەو دووانە وتیان: هاوار لەتۆ، ئایینەکەی تۆ باشترە لەدینەکەی ئەو.

ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و مەبەستی مەککەی کرد. کاتێك قولایی شەو داهات، هەستا و بۆ نوێژ وەستا. لەم کاتەدا دەستەیەك لەپەرییەکان کەحەوت دانەبوون، لایەوە تێپەڕین. ئەوان لەپەرییەکانی سەرزەمینی نەسیبین بوون و دەڕۆشتن بۆ یەمەن. پەرییەکان گوێیان لەقسەکانی ئەو دەگرت و کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد، بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە و ئاگاداریان کردنەوە تا باوەڕ بەئیسلام بێنن.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لای سەقیفییەکان گەڕایەوە، کەسێکی بۆلای موتعیم کوڕی عودەی نارد تا پەنای بدات و بتوانێت پەیامی خوا بەخەڵك رابگەیەنێت. ئەو پەنای بە پێغەمبەردا. بەرەبەیانی بەیانی، موتعیم و کوڕەکانی ئەو و کوڕەکانی براکەی جل وبەرگی شەڕیان لەبەر کرد و ڕۆشتنە ناو مزگەوت. ئەبو جەهل وتی: پەناتدا یا باوەڕت بەئایینەکەی هێناوە؟ موتعیم وتی: پەنام داوە. ئەبوجەهل وتی: ئەوەی تۆ پەنای بدەیت، پەنای دەدەین. پێغەمبەر(د.خ) هاتە مەککە و لەوێ مایەوە. کاتێك ئەبوجەهل ئەوی بینی، وتی: ئەی منداڵەکانی عەبد مەناف، ئێستا سەیری ئەم پیاوە بکەن کەپێغەمبەری ئێوەیە! عوتەبە کوڕی رەبیعە وتی: کوا شیاوی سەرکۆنە کردنە لەناو ئێمە پێغەمبەر(د.خ) و پاشایەك بەم شکۆ و بەرزییەوە دەرکەوێت؟ هەواڵی ئەم کارە بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت. ئەو هاتە لای ئەوان وتی: بەلام تۆ ئەی عوتەبە، بۆ خوا نەهاتیتە جۆش کەبۆ خۆت، بەلام تۆ ئەی ئەبوجەهل، سوێند بەخوا زۆری پێناچێت کەم پێدەکەنیت و زۆر دەگریت، بەلام ئێوە ئەی قورەیشییەکان، زۆر ناخایەنێت ئەوەی پێی رازی نابن، بەریسوایی وەریدەگرن و باوەڕی پێدێنن. پێشهاتەکان بەوشێوە بون کەپێغەمبەر(د.خ) ئاماژەی پێدا.

پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی حەج کردن و ئەنجامدانی رێورەسمەکانی حەج دەڕۆشتە لای هۆزە عەرەبییەکان و بانگەوازەکەی بۆ ئەوان ئاشکرا دەکرد. ڕۆشتە ناو ماڵەکانی منداڵەکانی کەنەدە و سەرۆکەکەیان مولەیح لەناویاندا بوو. پێشنیاری

باوەڕ هێنانی پێکردن و بانگەوازەکەی ئاشکرا کرد بەڵام باوەڕیان نەهێنا. ئەوسا ڕۆشتە لای هۆزی کەلب و لای بنەماڵەیەك لەوان بەناوی منالەکانی عەبدوڵڵە دابەزی و بانگەوازەکەی بۆ ئاشکرا کردن بەڵام رازی نەبوون. دواتر ڕۆشتە لای منالەکانی حەنیفە و ئەوانی بۆ باوەڕ هێنان هاندا کەهیچ کام لەهۆزە عەرەبییەکان وەڵامێکی باشتریان لەم هۆزە بەپێغەمبەر(د.خ) نەدایەوە. دوای ئەوە ڕۆشتە لای منالەکانی عامر و ئیسلامی پێشنیار کرد. یەك لەوان وتی: ئەگەر شوێن تۆ کەوین و خوا تۆ بەسەر دوژمنەکانت زاڵ بکات، ئایا کاری فەرمانڕەوایی خەڵکەکەت دەکەوێتە دەست ئێمە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: پەیوەستە بەویستی خوا کە لەهەر شوێنێك بیەوێت دەیکاتە جێگر. پیاو وتی: سینەی خۆمان بۆ تۆ لەبەرابەر عەربەکان بکەین بەقەڵغان و کاتێك تۆ زاڵ بویت، کاری فەرمانڕەوایی بکەوێتە کەسانێك جگە لەئێمە؟ ئێمە پێویستمان بەئایینەکەی تۆ نییە.

کاتێك منالەکانی عامر ڕۆشتنە لای پیرەپیاوێکی بەتەمەن لەخۆیان و هەواڵی کاری پێغەمبەر و نەژاد و بنەماڵەکەیان پێدا، دەستی خستە سەر سەر و وتی: ئەی منالەکانی عامر، ئایا دەتوانین چارەی ئەم زیانە گەورەیە بکەین (کەبە ئایینەکەی ئەو رازی نەبوون). سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، هەرگیز هیچ پیاوێکی ئیسماعیلی درۆی بەدەم خواوە هەڵنەبەستووە. ئەم بانگەوازە ڕاستە. ئێوە کەی دەتوانن لەقوڵاییەکەی بگەن!

پێغەمبەر(د.خ) بەردەوام ئایینی ئیسلامی بۆ هەر هاتووێك کەناو و نەژادێکی هەبوایە، پێشنیار دەکرد. بۆ لای هەر هۆزێك دەڕۆشت و بانگەوازەکەی بۆ ئاشکرا دەکردن. مامەکەی ئەبولەهەب بەدوایدا دەڕۆشت. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەوتارەکەی خۆی تەواو دەبوو، ئەبولەهەب ڕوویدەکردە ئەوان و دەیوت: ئەم پیاوە داواتان لێدەکات واز لەلات و عوزا بێنن و تەوقی خۆشەویستی ئەوان لەملی خۆتان بکەنەوە و هاوپەیمانەکانی خۆتان لەپەرییەکان بڕەنجێنن و ڕووبکەنە گومرایی. گوێ لەقسەکانی مەگرن و باوەڕی پێ مەکەن.

## یەکەم دیداری پێغەمبەر( د.خ ) لەگەڵ ئەنسار و باوەڕ هێنانی ئەوان

لەم کاتەدا سوەیەد کوڕی سامت برای منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف (یەکێك لەبنەماڵەکانی ئەوس) هاتەمەککە تا حەج و عەمرە بکات. پیاوێکی چالاك و بیرتیژ و وتاردەر بوو، پێیان دەوت کامل. ئەوە کەدەڵێت:

الا رب من تدعو صدیقا و لوتری   مقالته بالغیب ساءك ما یفری
مقالته کالشحم ما کان شاهدا   و بالغیب ماثور علی ثغرة النحر
یسرك بادیه و تحت ادیمه   نمیمة غش تبتری عقب الطهر
فرشنی بخیر طالما قد بریتنی   فخیر الموالی من یریش و لا یبری

واتاکەی: چەن زۆر ئەو کەسەی بەهاوڕێی خۆتی دەزانی و ئەگەر وتاری ئەو بەنهێنی ببیستیت، لەو درۆیەی بۆ تۆی هەڵبەستووە، تورە دەبیت. تا ئەو کاتەی لای تۆیە وتارەکەی وەك دوك چەور و نەرمە بەلاَم بەنهێنی وەك ڕم قورگی تۆ دەکات بەنیشانە. دەسپێکی کارەکەی تۆ شادمان دەکات بەلاَم لەژێر پێستییەوە ڕازاندنەوەیەك لەفێڵبازی و نامۆییە کەپشت و کەمەر دەشکێنێت. چاوەکانی ئەوەی دەیشارێتەوە، ئاشکرا دەکات و لەڕوانینە توندەکەی نیشانەکانی دوژمنی و ڕق دەخوێنێت. کاتێك منت داتاشی، پەڕم پێوە بکە چوونکە باشترینی هاورێکان ئەوەیە پەڕت پێوە بکات و نەت تاشێت و لەتۆ کەم نەکاتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) ڕووی تێکرد و ئیسلامی بۆ باس کرد و قورئانی بۆ خوێندەوە. سوەید کوڕی سامت خۆی لێ دوورنەخستەوە و وتی: ئەمە وتارێکی جوانە. ئەوسا گەڕایەوە و ڕوویکردە مەدینە. ئەوەندەی نەخایاند خەزرەجییەکان کوشتیان. ئەو لەشەڕی بەعاس کوژرا. خەڵکەکەی دەیانوت، ئەو موسوڵمان بوکەشەربەتی گیانبەخشینی نۆش کرد.

لەم ناوەدا باوکی حەیسەر ئونس کوڕی ڕافع لەگەڵ چەندین گەنج لەمناڵەکانی عەبد ئەلئەشهل کەئەیاس کوڕی موعاز لەگەڵیانا بوو، هاتە مەککە و دژی خەزرەجییەکان بەدوای هاوپەیمان دەگەڕان. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای ئەوان و وتی: ئایا دەتانەوێت شتێکی باشتر لەوەی بۆی هاتوون، پێشنیار بکەم؟ ئەو ئیسلامی پێ پێشنیار کردن و قورئانی بۆ خوێندنەوە. ئەیاس کەتازە گەنجێك بوو، وتی: سوێند بەخوا باشترە لەوەی بۆی هاتووین. باوکی حەیسەر مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەر و ڕوخساریدا و وتی: واز لەئێمە بێنە بۆ کارێکیتر بۆ ئێرە هاتووین. ئەیاس بێدەنگ بوو و پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنەکەی هەستا. زۆری نەخایاند، ئەیاس مرد. خەڵکەکەی ئاوازی ئەویان لەکاتی گیان سپاردن دەبیست کەسوپاسی خوای دەکرد و بەگەورەیی ناوی دەهێنا. گومانیان نەبوو لەوەی ئەو بەموسوڵمانی مرد.

## بەیعەتی یەکەم لەعەقەبە و باوەڕ هێنانی سەعد کوڕی مەعاز

کاتێك خواوەند ویستی ئایینەکەی خۆی ئاشکرا بکات و مژدەکەی بەئەنجام بگەیەنێت، پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی حەج کردن هاتەدەر و چاوی بەدەستەیەك لەئەنسار کەوت و بەهەمان شێوەی باو، ئیسلامی بۆ هۆزەکان پێشنیار کرد. جارێکیان لەگەردەنەی کوێستانی عەقەبە بوو، چاوی بەدەستەیەك لەخەزرەجییەکان کەوت وئیسلامی پێ پێشنیار کردن و داوای لەوان کرد باوەڕ بەئیسلام بێنن. لەشاری ئەوان دەستەیەك لەجوولەکەکان خواپەرەست بوون بەڵام خەزرەجییەکان بتیان دەپەرەستی. کاتێك لەنێوان ئەوان کێشەیەك ڕوویدەدا، جوولەکەکان دەیان وت: بەزوویی پێغەمبەرێك دەردەکەوێت کەشوێن ئەو دەکەوین و ئێوە بەهاوکاری ئەو وەك نەتەوەی عاد و سەمود لەناو دەبەین. ئەو خەڵکانە بەیەکیان وت: سوێند بەخوا ئەمە هەمان پیاوە، جوولەکەکان بەردەوام بەهاتنی ئەو ئێمە دەترسێنن. ئەوان وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوە و بەراستگۆیان زانی و وتیان: لەناو خەڵکەکەی ئێمە شەڕێك ڕوویداوە. هیواداریین بەهاتنی تۆ، خوا ئەوان کۆبکاتەوە و ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر بکات. ئەگەر لەدەوری تۆ کۆببنەوە،

هــیچ کــەس لــەتۆ بــەرێزتر نابێــت. ئەوســا ئــەوان (کەحــەوت کــەس بــوون لەحەزرەجییەکان) سڵاویان بۆ نارد: باوکی ئومامە ئەسعەد کوڕی زەرارە کوڕی عودەس، عەوف کوڕی حارس کوڕی ریفاعە کوڕی عەفرا (هەردووك لەمناڵەکانی نەجار) رافیع کوڕی مالك کوڕی عەجلان، عامر کوڕی عەبدحارسە کوڕی سەعلەبە کوڕی غەنم ( هەردووك لەمناڵەکانی زورەیق) قوتبە کوڕی عامر کوڕی حەدیدە کوڕی سواد لەمناڵەکانی سەلیمە، عوقبە کوڕی عامر کوڕی نابی لەمناڵەکانی غەنم و جابر کوڕی عەبدوللە کوڕی ریاب لەمناڵەکانی عوبەیدە.

کاتێك ئەوان بۆ مەدینە گەڕانەوە، باسی پێغەمبەریان بۆ خەڵکەکەیان کرد و داوایان کرد باوەڕ بەئیسلام بێنن ئەم دینە لەناو ئەواندا بڵاو بویەوە. بۆ ساڵی داهاتوو، دوانزە کەس لەئەنسار بۆ حەج کردن ڕوویان لەمەککە کرد و لەگەردەنە چاویان بە پێغەمبەر(د.خ) کەوت و ئەمەیان بە(گەردەنەی یەکەم) عەقبەی یەکەم ناوبرد و لەگەڵ ئەو بەیعەتیان بەست وەك بنەماڵەی خۆیان بەرێز و رێزداری بزانن. ئەم کەسانە بوون: ئەسعەد کوڕی زورارە، عەوف و مەعاز کوڕانی حارس، رافیع کوڕی مالك کوڕی عەجلان، زەکوان کوڕی عەبد قەیس لەمناڵەکانی زورەیق، عوبادە کوڕی سامت لەمناڵەکانی عەوف کوڕی خەزەرج، باوکی عەبدولرەحمان یەزید کوڕی سەعلەبە کوڕی خەزمە لە(بلی) لەهاوپەیمانەکانی ئەوان، عەباس کوڕی عوبادە کوڕی نەزلە لەمناڵەکانی سالم، عوقبە کوڕی عامر کوڕی نابی، قوتەبە کوڕی عامر کوڕی حەدیدە(هەموویان لەخەزرەجییەکان). لەئەوسییەکان ئەمانە لەوێ بوون: باوکی هەیسەم کوڕی تەیهان هاوپەیمانی مناڵەکانی عەبد ئەلئەشهەل و عوەیم کوڕی ساعدە هاوپەیمانی ئەوان.

لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتن و پێغەمبەر(د.خ) مەسعەب کوڕی عومەیر کوڕی هاشم کوڕی عەبد مەناف کوڕی عەبدئەلداری لەگەڵ ئەوان رەوانە کرد تا قورئانیان بۆ بخوێنێتەوە و فێری رێورەسمەکانی ئیسلامیان بکات. ئەو ڕۆشتە مەدینە و لای ئەسعەد کوڕی زورارە مایەوە. ئەسعەد کوڕی زورارە هاتەدەر و ڕۆشتە ماڵی مناڵەکانی زەفەر و لەوێ دانیشت و ئەو پیاوانەی باوەڕیان بەئیسلام هێنابوو، لەدەوری کۆبونەوە. ئەم هەواڵە گەشتە گوێی سەعد کوڕی مەعاز و ئوسەید کوڕی

حوزەیر، سەروەرانی منالەکانی عەبدئەلئەشهەل کەهەردووکیان بتپەرەست بوون. سەعد بەئوسەیدی وت: برۆ لای ئەم دووانە کەهاتوونەتە مالی ئێمە و لەم کارە دووریان خەرەوە. ئەگەر ئەسعەد کوری زورارە کورە خالەکەمیان لەگەلْ نەبوایە، خۆم ئەم کارەم دەکرد و ئەم ئەرکەم نەدەخستە سەرشانی تۆ. ئوسەید کەلوپەلی شەری هەلگرت و مەبەستی ئەوانیکرد. کاتێك گەشتە لای ئەوان، وتی: بۆ هاتوونن بۆ ئێرە تا خەلکە سست باوەرەکەی ئێمە لەخشتە بەرن؟ لێرە برۆن. مەسعەب وتی: ئایا ماویەك دانانیشیت تا گویْ بگریت؟ ئەگەر شتێکت پەسەند کرد پێی رازی دەبیت وئەگەر پەسەندت نەکرد، کەسانێتر ئەو ئەرکە لەکۆلْ تۆ دەکەنەوە و ئەوەی بەدوژمنی دەزانی، خۆمان لای دەبەین. ئوسەید وتی: قسەیەکی باشت کرد. لای ئەو دووانە دانیشت. مەسعەب سەبارەت بەئیسلام قسەی بۆ کرد. ئوسەید وتی: چەن بەشکۆ و جوانە! کاتێك دەتانەوێت بێنە سەر ئەم دینە،چ کارێك دەکەن؟ ئەو دووانە وتیان: خۆت بشۆ، جلەکانت پاك و خاوێن بکە، شایەتی راست و دروست بدە و ئەوسا دوو رەکعەت نوێژ بخوێنە. ئەم کارەی کرد و باوەری بەئیسلام هێنا. دواتر پێی وتن: من لەپشتمەوە پیاوێکە ئەگەر باوەر بەئایینەکەی ئێوە بێنێت، هیچ کەس لەخەلکەکەی لەباوەر هێنان ناکشێتەوە. ئێستا ئەو بۆ لای ئێوە دەنێرم. ئەو سەعد کوری مەعازە.

ئەو رۆشتە لای سەعد و خەلکەکەی. کاتێك سەعد سەیری کرد، وتی: سوێند بەخوا، بەروخسارێکی جیاوازەوە هاتۆتەوە. سەعد پێی وت: چیت کرد؟ ئوسەید وتی: سوێند بەخوا خراپیم لەو دووپیاوە نەبینی. بەمنیان وت منالەکانی حارسە رۆشتوون تا ئەسعەد زورارە بکوژن. سەعد تورە لەشوێنەکەی هەستا و هەنگاوی بردە پێشەوە چوونکە دەترسا، ئەوەی پێیان وتووە، ئەنجامی بدەن . ئەوسا رۆشتە لای ئەو دووانە و کاتێك بینی ئەوان مەترسییان نییە، زانی ئوسەید لەو قسەی مەبەستێکی هەبووە. لای ئەوان وەستا و بەئەسعەد کوری زورارەی وت: ئەگەر لەنێوان من و تۆ پەیوەندی خزمایەتی نەدەبوو، ئەم کارەت لەگەلْ من نەدەکرد. مەسعەب پێی وت: ئایا کەمێك دانانیشیت و گویْ بگریت؟ ئەگەر شتێك پەسەند کرد، پێی رازی دەبیت و ئەگەر پەسەندت نەکرد، ئەوەی بەدوژمنی دادەنێی، لەتۆی

دوردەکەینەوە. سەعد دانیشت و مەسعەب سەبارەت بەئیسلام قسەی بۆ کرد و قورئانی بۆ خوێندەوە. پێی وتن: کاتێك دەتانەوێت بێنە سەر ئەم دینە چ کارێك ئەنجام دەدەن؟ هەمان قسەیان پێ وت کە بەئوسەیدیان وتبوو. ئەو جەستە و جل و بەرگەکانی پاك و خاوێن کرد. دواتر هاوڕێ لەگەڵ ئوسەید کوڕی حوزەیر بەرەو شوێنی کۆبونەوەی خەڵکەکەی خۆی ڕۆشت و کاتێك لای ئەوان وەستا، وتی: ئەی منداڵەکانی عەبدئەلئەشهەل، من لەناو خۆتان چۆن دەبینن؟ وتیان: سەروەری ئێمەیت وباشترینی ئێمە. وتی: ئەگەر وایە، قسە کردن لەگەڵ ژنان وپیاوانی ئێوە بۆ من ناڕەوایە تا باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی بێنن. دەڵێت: سوێند بەخوا لەبنەماڵەی هیچ ژن وپیاوێك نەما مەگەر ئەوەی باوەڕی بەئیسلام هێنا.

مەسعەب بۆ ماڵی ئەسعەد گەڕایەوە و بەردەوام خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان هاندەدا تا ئەو جێگەی هیچ بنەماڵەیەك لەماڵەکانی ئەنسار نەمایەوە مەگەر ئەوەی ژن یا پیاوی موسوڵمانی تیابوایە. ئەمە جگە لەمناڵەکانی ئومەییە کوڕی زەید و وایل و واقف چوونکە ئەوان شوێن باوکی قەیس کوڕی ئەسلەت کەوتن کەرێگری کرد لەباوەڕ هێنانی ئەوان تا پێغەمبەر(د.خ) بۆمەدینە کۆچی کرد و شەڕی بەدر و ئۆحۆد و خەندەقی ڕوویدا. مەسعەب بۆ مەککە گەڕایەوە.

## بەیعەتی دوەم لەعەقەبە

کاتێك ئیسلام لەناو ئەنسار بڵاوبویەوە، دەستەیەك لەئەنسار هاودەست بوون بڕۆنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەوان بەنهێنی کاریان دەکرد تا کەس لەنهێنییەکەیان ئاگادار نەبێتەوە. لەبەر ئەمە، لەکاتی حەج کردن لەزیحەجە هاوڕێ لەگەڵ بتپەرستەکان و ناباوەڕانی خەڵکەکەی خۆیان ڕۆشتنە مەککە و چاویان پێی کەوت و مژدەیان بەیەك دا لەناوەڕاستەکانی تەشریق (سێ ڕۆژ دوای جەژنی ئە ضحی) دوبارە یەکتر لەگەردەنەی عەقەبە ببینن.

کاتێك دوبەشی تێپەڕی، ئارام ئارام و بەنهێنی لەماڵەکانی خۆیان هاتنەدەر و بەهێواشی بەرەو عەقەبە ڕۆشتن و کاتێك لەوان کۆبونەوە، ژمارەیان گەشتە حەفتا پیاو. دو ژنیشیان لەگەڵدا بوو. نوسەیبیە کچی کەعب دایکی عومارە و ئەسمە

دایکی عەمرۆ کوڕی عودەی لەمناڵەکانی سەلمە. پێغەمبەر(د.خ) هاوڕێ لەگەڵ عەباس کەهێشتا ناباوەڕ بوو، ڕۆشتە لای ئەوان. عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب دەیویست بۆ برازاکەی خۆی لەئەنسار پەیمانی بەهێز وەربگرێت. عەباس یەکەم کەس بوو دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: ئەی دەستەی خەزرەجییەکان (خەزرەج و ئەوسیان بەمشێوەیە بانگ دەکرد)، دەزانن محەممەد لای ئێمە چەندە ئازیز و رێزدارە و ئێمە بەباشی پارێزگاری لێدەکەین. ئەو پێداگری دەکات لەئێمە جیاببێتەوە و پەیوەستی ئێوە بێت. ئەگەر دەزانن پەیمان و بەڵێنەکانی خۆتان بەباشی دەبەنە سەر و پارێزگاری لێدەکەن، محەممەد بۆ ئێوە. بەڵام ئەگەر گومان دەکەن بەجێی دەهێڵن، دەستی لێ هەڵگرن کەئەو ئازیز و رێزدارە و ئێمە پارێزگاری لێدەکەین.

ئەنسار وتیان: ئەوەی ئاماژەت پێدا بەدڵ و گیان جێبەجێی دەکەین. ئێستا ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ قسە بکە و بۆ خۆت و خواکەت، پەیمان وەربگرە. پێغەمبەر(د.خ) قسەی کرد و قورئانی خوێند و بیسەرانی بۆ باوەڕ هێنان هاندا و دواتر فەرمووی: بەشێوەیەك پارێزگاریم لێ بکەن کە پارێزگاری لەژنان و مناڵەکانتان.

دواتر بەرا‌ء کوڕی مەعرور دەستی ئەوی گرت و وتی: سوێند بەو کەسەی بەراستی و دروستی تۆی ناردووە، بەوشێوەیە پارێزگاریت لێ دەکەین. لەگەڵ ئێمە بەیعەت بکە ئەی پێغەمبەری خوا چوونکە پیاوانی بەئەزمونین لەشەڕ کردندا.

باوکی هەیسەم کوڕی تەیهان گفتوگۆکەی بڕی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لەنێوان ئێمە و خەڵکەکەی ئێوە پەیوەندی خزمایەتی هەیە کەئێستا دەمانەوێت ئەم پەیوەندیە ببڕین. ئایا دەکرێت ئەگەر خوای گەورە تۆی سەرکەوتوو کرد، بەرەو لای خەڵکەکەی خۆت بگەڕێیتەوە و ئێمە بەتەنیا جێ بێڵیت؟

پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی و وتی: نە، بەمشێوە نییە. بەڵکو خوێن، خوێن، وێرانی، وێرانی، من لەئێوەم و ئێوە لەمن. لەگەڵ هەرکەس ئاشت بن، ئاشتم و لەگەڵ هەر کەس شەڕ بکەن شەڕ دەکەم. دوبارە پێغەمبەر(د.خ) وتی: بۆ من دوانزە نوێنەر لەخەڵکەکەی خۆتان دیاری بکەن تا پەیام گەیێنەری من بۆ لای خەڵکەکەی خۆتان

بن. ئەوان دوانزە نوێنەر(نۆ لەخەزرەج و سیان لەئەوسیان) هەڵبژارد.

لەم کاتەدا عەباس کوڕی عوبادە کوڕی نەزلە ئەنساری هاتەقسە و وتی: ئەی دەستەی خەزرەجییەکان، ئایا دەزانن لەسەر چ بنەمایەك لەگەڵ ئەم پیاوە بەیعەت دەکەن؟ لەسەر بنەمای شەڕ لەگەڵ سوورایی و ڕەشایی. ئەگەر گومان دەکەن کاتێك سامانەکانتان تالاّن بکرێت و گەورەکانتان بکوژرێت، بەتەنیا جێی دێڵن، سوێند بەخوا ئەمە هۆکاری سووکی و ریسوایی ئەم جیهان و ئەو جیهانە. ئەگەر دەزانن پەیمانەکەی خۆتان دەبەنەسەر، دەست بەدوایێنی ئەو بگرن کە چاکی وبەختەوەری هەردوو دنیایی تیایە.

وتیان: ئێستا ئێمە لەسەر بنەمای کوژرانی گەورەکان و تالاّن کردنی سامانەکانمان پەیمانی لەگەڵ دەبەستین. ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لەبەرابەر ئەم کارانە چیمان پێ دەبڕێت؟ فەرمووی: بەهەشتی هەمیشەیی وشادمانی بێ کۆتایی. وتیان: دەستتان بێنن. هەمووان بەیعەتیان لەگەڵ کرد.

عەباس کوڕی عوبادە ئەم قسەی تەنیا لەبەر ئەوە کرد پەیمانەکەی ئەوان بەهێزتر بکات. دەستەیەك دەڵێن: وانییە، بەڵکو بۆیە ئەو قسەی کرد تا بەیعەتەکە دوابخات تا عەبدوڵڵە کوڕی باوکی سەلول ئامادە بێت.

یەکەم کەس دەستی خستە ناو دەستی، باوکی ئومامە ئەسعەدی کوڕی زورارە یا باوکی هەیسەم کوڕی تەیهان یا بوراء مەعرورو بوو. ئەوسا خەڵك بەدوایدا بەیعەتیان لەگەڵ کرد. کاتێك بەیعەتیان تەواو کرد، دێو هاواری کرد: ئای ئەو کەسانەی لەماڵەوەن، ئەی شارنشینەکان، ئایا دەتانەوێت پیاوێکی سەرکۆنەکراو بناسن کەدەستەیەك منالّ دەوریان گرتووە و دەیانەوێت لەگەڵ ئێوە شەڕ بکەن؟ پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی دوژمنی خوا، هەموو هێزی خۆم بۆ شەڕ لەگەڵ شەیتان کۆدەکەمەوە و تۆی ناپاك دووردەخەمەوە. دواتر وتی: بڕۆنەوە بۆ ناو خێوەتەکانی خۆتان.

عەباس کوڕی عوبادە دەڵێت: سوێند بەو کەسەی بەراستی و دروستی تۆی بۆ پێغەمبەری ناردووە، ئەگەر بتەوێت، بێ گومان بەیانی بەشمشێرەکانی خۆمان هێرش دەکەینە سەر مەنی. پێغەمبەر(د.خ) وتی: هێشتا فەرمانی ئەم کارەمان پێ

نەدراوە. ئەوان گەڕانەوە.

کاتێك بەیانی داهات، گەورەکانی قوڕەیش هاتنە لای ئەوان و وتیان: هەواڵمان پێگەیشتوە ئێوە ڕۆشتونەتە لای ئەم هاوڵاتییەی ئێمە و بەیعەتتان لەگەڵ کردووە تا بیبەنە لای خۆتان و خۆتان بۆ شەڕ لەگەڵ ئێمە ئامادە بکەن. سوێند بەخوا ئێمە شەڕکردن لەگەڵ ئێوە بەناپەسەندتر دەزانین لەهەموو بنەماڵەکانی عەرەب و هیچکات نامانەوێت لەگەڵ ئێوە شەڕ بکەین. لەم کاتەدا بتپەرستەکان کەلەناو ئەنساردا بوون، سوێندیان خوارد شتی وا ڕوووینەداوە.

کاتێك ئەنسار لەمەککە ڕۆشتن، بەرائ کوڕی مەعرور وتی: ئەی دەستەی خەزرەجییەکان، پێم باشە لەکاتی نوێژ پشت نەکەمە کەعبە. پێیان وت: پێغەمبەر(د.خ) ڕوودەکاتە شام و نوێژ دەخوێنێت. کاتێك هاتە مەککە سەبارەت بەوە لەپێغەمبەر(د.خ) پرسیاری کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ڕووت لەقیبلە بوو، ئەگەر لەسەری بەردەوام بیت (ئەگەری هەیە لەبەر ئەوە بووبێت کەدەیزانی قیبلە بەرەو کەعبە دەگۆڕێت). کاتێك لەگەڵ ئەو بەیعەتیان کرد وبەرەو مەدینە بەڕێکەوتن، گەشتنیان بۆ ئەم شارە لەزیحەجەدا بو. پێغەمبەر(د.خ) پاشماوەی زیحەجە و محەرەم و سەفەری لەمەککە بەسەر برد و لەمانگی ڕەبیع ئەلئەوەل دوای دوانزە شەو بۆ مەدینە کۆچی کرد.

کاتێك قوڕەیشییەکان بیستیان ئەنسار باوەڕیان بەئیسلام هێناوە، زیاتر زەختیان کردە سەر موسوڵمانەکانی مەککە و هەوڵیاندا ئەوان لەدینەکەیان هەڵگەڕێننەوە. موسوڵمانان بەتەواوی کەوتنە ڕەنجەوە. ئەمە دوایین سەخت گرتن بوو لەسەر ئەوان. یەکەم سەخت گرتن دوای کۆچ کردنی ئەوان بۆ حەبەشە بوو.

بەیعەت لەعەقەبە جیاواز بوو لەوەی لەعەقەبەی یەکەم ئەنجام درا. بەو بەیعەتە دەڵێن بەیعەتی ژنان و ئەمەیان لەسەر بنەمای شەڕ لەگەڵ سوری و ڕەشایی ئەنجام درا.

ئەوکاتە پێغەمبەر(د.خ) بەهاوەڵانی خۆی وت بۆ مەدینە کۆچ بکەن. یەکەم کەس گەشتە ئەو شارە، باوکی سەلەمە کوڕی عەبدئەلئەسوەد بوو. ئەو یەك ساڵ پێش بەیعەت بۆ مەدینە کۆچی کرد. دواتر بەدوای ئەو، عامر کوڕی ڕەبیعە هاوپەیمانی

منداڵـەکانی عـودەی لەگـەڵ هاوسـەرەکەی لـەیلا کـچی بـاوکی حەسمـە و ئەوسـا عەبدوڵڵە کوڕی جەحش هاوڕێ لەگەڵ براکەی و هەموو کەسەکانی بۆمەدینە کۆچی کرد. دواتـر عومـەر کـوڕی خـەتاب و عـەیاش کـوڕی بـاوکی ڕەبیعـە کۆچیان کـرد و لەماڵی منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف مانەوە. لەم کاتـەدا ئەبوجەهل کوڕی هوشـام و حـارس کـوڕی هوشـام ڕۆشـتنە لای بـاوکی ڕەبیعـە لەمەدینـە ( و ئـەم دووانـە لەدایکەوە برای بوون). هەردووك پێیـان وت: دایکـت سوێندی خواردووە لەسێبەرا دانەنیشێت و قژی خـۆی شـانە نـەکات. ئـەو بـەزەیی بەدایکیا هاتـەوە و بـۆ مەککـە گەڕایــەوە. هــاوەڵانی پێغەمبــەر(د.خ) بــەردەوام بــۆ مەدینــە کۆچــیان دەکــرد و سەرئەنجام کاتی کۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت.

## کۆچ کردنی پێغەمبەر( د.خ ) خوا

کاتێك هـاوەڵانی پێغەمبـەر(د.خ) یـەك لـەدوای یـەك بـۆ مەدینـە کۆچیان کـرد، ئـەو لەمەککە مایەوە و چاوەڕوانی فەرمانی خوای دەکرد. لەگـەڵ ئـەو عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیــب و ئەبوبــەکر مانــەوە. کاتێــك قوڕەیــشییەکان ئەمــەیان بــینی، ترســان پێغەمبـەریش بـڕوات و لەدەسـت ئـەوان ڕزگـاری بێـت. ئـەوان لەماڵیقوسـەی کـوڕی کەلابی قوڕەیشی کۆبونـەوە. بتپەرستەکان بۆ ڕێگـە چارە لەبەرابەر پێغەمبـەر(د.خ) کۆبونەوە. دێو لەڕوخساری پیرە پیاوێك دەرکەوت و لەکۆڕەکـەی ئـەوان دانیشت و وتـی: مـن لەخـەڵکی نەجـدم هـەواڵی کارەکـانی ئێـوەم بیـست و هاتمـە ئێـرە تـا لەبۆچوونەکەی من بێ بەش نەبن.

ئەوانەی کۆببونەوە بریتیبوون لـە: عوتەبـە، شیبە، ئەبوسوفیان، تۆعەیمە کوڕی عــودەی، حــەبیب کــوڕی مــوتعیم، حــارس کــوڕی عــامر، نــەزر کــوڕی حــارس، ئەبوبەختەری کوڕی هشام، ڕەبیعە کوڕی ئەسوەد، حەکیم کوڕی حوزام، ئەبوجەهل، نەبیە کوڕی حەجاج، مونەبە کوڕی حەجاج، ئومەییە کوڕی خەلەف و کەسانیتر.

بەیـەکیان وت: کـاری پێغەمبـەر گەشـتۆتە شـوێنێك کـەلێی ئاگـادارن، ئێـستا لـەوە دەترسـین لەگـەڵ شـوێنکەوتووانی خـۆی هێـرش بکاتـە سـەرمان و لـەناومان ببـات. بیرۆکەکانی خۆتان بخەنەکار و کارێکی بەکۆمەڵ بکـەن و ڕێگـە چارەیەك بدۆزنـەوە.

یەکیان وتی: بەند وزنجیر بکەنە دەستە و قاچی و زینداني بکەن و درگای لەسەر دابخەن تا ئەو بەڵایەی بەسەرا بێت کەبە سەر هەموو وتاردەرەکان دێت( بمێنێتەوە و ئەوەندە قسە بکات تا بەتەواوی شێت ببێت یا بمرێت). پیاوی نەجدی وتی: ئەگەر زینداني بکەن، ئەم هەواڵە بەگوێی هاوەڵانی دەگات و زۆر ناخایەنێت هێرش دەکەنە سەرتان و ئەو رزگار دەکەن. ئەویتر وتی: لەشارەکەمان دەری دەکەین و کاتێك لەبەر چاو ونبوو، ترسمان نییە بۆ کوێ دەڕوات وچی بەسەر دێت. نەجدی وتی: ئایا شیرین قسەیی و بەهێزی وتارەکانی ئەو نازانن؟ ئەگەر ئەم کارە بکەن، دەڕوات و لای یەکێك لەبنەماڵەکانی عەرەب نیشتەجێ دەبێت و بەقسەی خۆش ئەوان هەڵدەخەڵەتێنێت و لەگەڵ ئەوان هێرش دێنێت و سەرزەمینەکەتان لەناو دەبات و ئێوەیش لەسەر کار لادەبات. ئەبوجەهل وتی: من دەڵێم لەهەر هۆزێك گەنجێك هەڵبژێرین و شمشێرێکی بدەینە دەست و ئەوسا پێکەوە هێرشی بکەینە سەر و یەکجار بەلێدانی شمشێر بیکوژین و لەناوی ببەین. کاتێك ئەم کارە بکەین خوێنی ئەو لەناو هۆزەکانی ئێمە بڵاو دەبێتەوە و مناڵەکانی عەبد مەناف ناتوانن لەگەڵ هەموو خەڵك شەڕ بکەن و لەبەر ئەمە بەخوێنبایی رازی دەبن. پیاوی نەجدی وتی: بۆچوونی راست ئەمەیە. ئەوان لەسەر ئەمە رێکەوتن و بڵاوەیان لێکرد.

جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەمەشەو لەجێگاکەی خۆت مەخەوە. کاتێك تاریکی شەو داهات، ئەوان لەدەوری ماڵەکەی کۆبوونەوە و چاوەڕێ بوون تا خەوی لێبکەوێت و لەناکاو هێرش بکەنە سەری. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی، بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی وت: ئەمەشەو لەجێگاکەی من بخەوە، بالاپۆشە سەوزەکەی من بەخۆتابە و بخەوە، دڵنیابە زیان بەتۆ ناگات. بەعەلی فەرموو: هەر ئەمانەتێکی خەڵك کەلای پێغەمبەرە بۆ خاوەنەکانی بگێڕێتەوە. پێغەمبەر(د.خ) هاتەدەر و مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەر و ڕوخساری ئەواندا و ئەم ئایایانەی خوێند: یاسین. سوێند بەقورانی ئاوز بزوێن. بێ گومان تۆ لەپێغەمبەرە راست و دروستەکانیت. ئەم قورئانە نێردراوێکە لەلایەن خواوەندی لەناوبەر و بەزەیی ئافرێن. تا خەڵکان ئاگادار بکەیتەوە کەباوکانیان ئاگادار کەرەوەیان نەبووە وئەوان ئاگادار نین بەکەمترین ئەندازە. زۆربەیان وتارەکانی خوایان پێگەشتووە

بەڵام باوەڕیان نییە بەدین. ئێمە زنجیرمان کردۆتە ملیان تاچەناکەیان بەشێوەیەك چاویان لەئاسمانە و نابینن بەردەمی خۆیان لەسەر زەمین. لەبەردەمیان و پشت سەریان ڕێگاکانمان کردەوە و پەردەکانمان لەبەرچاویاندا کێشا بەشێوەیەك بەمشێوەیە کوێر بوون( یس/٣٦/١-٩). دواتر پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و ئەوان نەیانبینی. کەسێك هات و لەوانی پرسی: چاوەڕوانی چی دەکەن؟ وتیان: محەممەد. وتی: خوا بێ هیوایی کردن. لەناو ئێوە ڕۆشت و هیچ کامتانی بەجێ نەهێشت مەگەر ئەوەی مشتێ خۆڵی کرد بەسەروچاویدا. دەستیان بۆ سەریان برد و بینیان تۆزاوییە. دەستیان بەگەڕان کرد و بینیان عەلی لەجێگەی خەوتووە و بالاپۆشەکەی پێغەمبەری پێوەیە. بەخۆیان وت: هێشتا محەممەد خەوتووە. چاوەڕێ دەکەین تابەیانی دادێت و لەخەو هەڵدەستێت. مانەوە تابەرەبەیان گەشت و عەلی وەك شێری ژیان لەخەو هەستا و بێ ترس لەوان خۆی دەکێشایەوە. خوا لەمبارەوە ئەم ئایەی نارد: کاتێك ناباوەڕان پیلانیان بۆ تۆ دادەنا تا لەزیندان بەندت بکەن یا بتکوژن یا دوورت بخەنەوە. ئەوان سەرقاڵی پیلانگێری بوون و خوا باشترینی چارەسەرکەرانە(ئەنفال/٨/٣٠). ئەو دەستەیەك لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب سەبارەت بەپێغەمبەر(د.خ) پرسیاریان کرد و وتی: نازانم. پێتان وت لەناو ئێوە بڕوات و ئەو ڕۆشت. ئەوان لێیاندا و بردیان بۆ مزگەوت و بۆ ماوەی کاتژمێرێك زیندانیان کرد و دواتر ئازادیان کرد. خوا پێغەمبەری لەفێڵەکەی ئەوان ڕزگار کرد و فەرمانی کۆچ کردنی پێدا. عەلی ماوەیەك مایەوە و ئەمانەتەکانی پێغەمبەری گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانیان وکارەکانی ئەوی ئەنجامدا.

عایشە وتی: هیچ ڕۆژێك نەدەبوو کەپێغەمبەر(د.خ) بەرەبەیان یا ئێوارە نەیێتە لای ئەبوبەکر تا ئەو ڕۆژەی گەیشت خوا فەرمانی کۆچ کردنی پێدا. ئەو ڕۆژە لەکاتی نیمەڕۆ هاتە ماڵی ئێمە. ئەبوبەکر وتی: هاتنەکەی لەمکاتەدا هۆکارێکی تازەی هەیە. کاتێك هاتە ناو، لەسەر تەخت دانیشت و وتی: ئەو کەسانەی لای تۆن، بنێرە دەرەوە. ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە دو کچەکەی منن، چی ڕوویداوە؟ پێغەمبەر وتی: خوا فەرمانێکی بەمن داوە کۆچ بکەم. ئەبوبەکر وتی: هاوڕێیم ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەر(د.خ) وتی: هاوڕێیت. ئەبوبەکر

لەشادیدا گریا. ئەو دووانە عەبدوللە کوڕی ئەرقەد لەمناڵەکانی دەیل کەبتپەرەست بوو، بەکرێ گرتیان تا ڕێگەی مەدینەیان نیشان بدات و ئەوان بباتە ئەو شارە. لەکۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ) جگە لەئەبوبەکر و عەلی و بنەماڵەی ئەبوبەکر، کەس ئاگادار نەبویەوە. بەڵام عەلی، پێغەمبەر فەرمانی پێدا بمێنێتەوە تا ئەمانەتەکان کەخەڵك لای پێغەمبەر دایاننابوو، بۆ خاوەنەکانی بگەڕێنێتەوە و پەیوەستی ئەو بێت. ئەو دووانە لەپەنجێرەیەك لەپشت ماڵی ئەبوبەکرەوە ڕۆشتن و دواتر بەرەو ئەشکەوتێك لەکێوی (ثور) ڕۆشتنەدەر و چوونە ناو ئەشکەوتەکە. ئەبوبەکر فەرمانی بەعەبدوللەی کوڕیدا بەجوانی گوێ لەباس و خواسەکانی ناو مەککە بگرێت و شەوانە بڕواتە لایان و ئاگاداریان بکاتەوە. ئەو فەرمانی بەکۆیلەکەی عامر کوڕی فوهەیرە دا بەرۆژدا مەڕەکانی بلەوەڕێنێت و شەوانە بڕواتە لای ئەوان. ئەسمە کچەکەی ئەبوبەکەر شەوانە خواردنی بۆ دەبردن. ئەو دووانە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەئەشکەوتەکەدا مانەوە.

قوڕەیشییەکان سەد وشتریان بەخشی بەکەسێك ئەوان بگەڕێنێتەوە.

کاتێك عەبدوللە کوڕی ئەبوبەکر لای ئەو دووانە دەهاتەدەر، عامر کوڕی فوهەیرە مەڕەکانی لەشوێن پێکانی ئەو دا دەلەوەڕاند تا شوێن پێکان بسڕێتەوە. دوای سێ ڕۆژ، ڕێنیشاندەرەکەی ئەوان دوو وشتری بۆ هێنان. پێغەمبەر(د.خ) یەکێك لەوشترەکانی وەرگرت و سواری بوو. ئەسمە کچی ئەبوبەکر دوو خوانی بۆ هێنان بەڵام بیری چوو بەند بێنێت لەبەر ئەمە پشتێنەکەی خۆی کردە بەند و خوانەکانی پێ هەڵواسی. لەوەدوا پێیان دەوت ئەسمە ی دوپشتێنە.

سوار بوون و بەرێکەوتن. ئەبوبەکر کۆیلەکەی لەپشت سەری خۆی سوار کرد تالەرێگا خزمەتیان بکات. شەو تا نیمەڕۆی ڕۆژی دواتر ڕێگایان بڕی. تاشەبەردێکی گەوریان بینی. ئەبوبەکر لەنزیکی تاشەبەردەکە، شوێنێکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) خۆش کرد تا لەسێبەرەکەیدا بحەوێتەوە و بخەوێت. پێغەمبەر(د.خ) خەوت و ئەبوبەکر پاسەوانی ئەوی کرد تاخۆر ئاوا بوو و بەرێکەوتن. قوڕەیشییەکان بۆ ئەو کەسەی پێغەمبەر(د.خ) بگەڕێنێتەوە، خەڵاتیان دیاری کردبو. سوراقە کوڕی مالك کوڕی جوعشەمی مودلیجی، بەدوای ئەو دووانەدا

بەرێکـەوت و لەزەوییـەکی بـەردەڵان بـەوان گەشـت. ئەبوبـەکر بەپێغەمبـەری وت: ئێمـەیان دۆزییـەوە! پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: خـەمبار مەبـە، خوامـان لەگەڵـە (توبە/٩/٤٠). پێغەمبـەر(د.خ) داوای هاوکاری لـەخوا کـرد. ئەسپەکەی ئەو تا سك لەخاکدا چەقی و لەژێریەوە تۆزێکی دوکەڵ ئاسا بەرز بویـەوە. سوراقە وتـی: ئەی محەممەد داوا لەخوا بکە من رزگار بکات و تۆ ئەم حەقت بەملی منەوە بێت تا ئەو کەسانەی بـەدواتا دەگـەڕێن، لـەرێ لابـدەم. پێغەمبـەر(د.خ) لـەخوا پاڕایـەوە و ئەو، ڕزگاری بو بەلاّم دووبارە شوێنیان کەوت. پێغەمبەر(د.خ) جارێکیتر لـەخوا پاڕایـەوە و ئەمجارە خراپتر لەپێش هەرچوار دەست وپێـی ئەسپەکەی لـەزەوی چەقی. وتـی: ئەی محەممەد بەباشی دەمزانی ئەمە بەهۆی دۆعاکەی تۆ بەسەر من دێت، لـەخوا داوا بکە و بەڵێن دەدەم ئەوانەی بەدواتا دەگەڕین لەرێ بەدەر بکەم. پێغەمبـەر(د.خ) داوای لـەخوا کـرد و ڕزگـاری بـوو و لەپێغەمبـەر(د.خ) نزیـك بویـەوە وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، تیرێـك وەك نیشانە لەتیردانەکـەی مـن هـەڵگرە و وشـترەکانی مـن لـەفلاّن شـوێنن، هەرچـەند وشـترت دەوێـت، هـەڵبگرە. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: مـن پێویستم بەوشترەکانی تۆ نییە.

کاتێـك سـوراقە ویـستی لەپێغەمبـەر(د.خ) جیـا ببێتـەوە، پێغەمبـەر(د.خ) ڕووی تێکرد و وتـی: ئـەی سـوراقە، چۆن دەبێت کاتێك دەسبەندە زێرینـەکانی خوسـرەو بکەیتە دەستت؟ سوراقە وتـی: خوسرەو کوڕی هورموز؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: بـەڵێ. سـوراقە گەڕایـەوە و هـەر کەسـێکی دەبـینی بـەدوای پێغەمبـەر(د.خ) دەگـەڕێت، دەیـوت: تا ئێرە بەسـە. چاوی بـەهیچ کەسێك نەکـەوت مەگـەر ئـەوەی بـۆ مەککـەی گەڕاندەوە.

ئـەسما کـچی ئەبوبـەکر دەڵێـت: کاتێـك پێغەمبـەر(د.خ) کۆچـی کـرد، دەسـتەیەك هاوریێ لەگەڵ ئەبوجەهل هاتن بۆ لای ئێمە و لەبەردەرگای ماڵی ئەبوبەکر وەستان و وتیـان: باوکـت لەکوێیـە؟ وتم: نـازانم. ئـەبو جـەهل دەسـتی بـەرز کـردەوە و شـەقەزللەیەکی لەروخسارمدا کەگوارەکـەم کەوتـە خـوار. پیـاوێکی زمـان پـیس و خراپـەکار بـوو. ئێمـە ماوەیـەك چاوەڕێمان کـرد و نەمانزانی پێغەمبـەر(د.خ) ڕووی لەکوێ کردووە. سـەرئەنجام یـەکێك لەپەرییـەکان لـەخوارەوەی مەککـە هـات و خـەڵك

شوێنی کەوتبوون، ئاوازی ئەویان دەبیست بەڵام خۆیان نەدەبینی و ئەو بەردەوام دەیوت:

جزا الله رب الناس خیر جزائه رفیقین حلا خیمتی ام معبد
هما نز لا بالهدی و اغتدیا فافلح من امسی رفیق محمد
لیهنیْ بنی کعب مکان فتاتهم ومقعدها للمومنین بمرصد

واتاکەی:

خوا، کەخواوەندی خەڵکانە، دوو هاوڕێی لەخێوەتەکەی ئێمە لەمەعبەد دابەزاندووە، باشترین پاداشتەکان دەدات. ئەو دووانە بەرێگایەکی راست هاتن و لەکاتی بەرەبەیان لەویٚ ڕۆشتن، رزگاری بووە ئەو کەسەی لەگەڵ محەممەدە. خۆش بێت بۆ منداڵەکانی کەعب شوێنێك کەکچە گەنجەکەیان هەیەتی چوونکە پێگەی ئەو شوێنی مزگێنی خوا باوەڕانە.

دەڵێت: کاتێك وتاری ئەو پەرییەم بیست، زانیم ڕووی لەمەدینە کردووە.

رێنیشاندەری ئەو دووانە، ئەوانی بردە قبا و پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دووشەممە لەکاتی گەرمەی نیمەڕۆ لای منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف دابەزی. پێغەمبەر(د.خ) لای کولسوم کوڕی هیدم برای عەمرۆ کوڕی عەوف دابەزی. دەستەیەك دەڵێن لای سەعد کوڕی خەیسەمە کە پیاوێکی بیٚ ژن بوو، دابەزی. پیاوانی بیٚ ژن لەهاوەڵانی محەممەد لای ئەو دەمانەوە و لەبەر ئەمە پێیان دەوت (ماڵی ڕەبەنەکان).

ئەبوبەکر لەشوێنێك بەناوی سنح لای خوبەیب کوڕی ئیساف یا خاریجە کوڕی زەید برای منداڵەکانی حارس لەخەزرەج دابەزی.

بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب، دوای ئەنجامدانی کارەکانی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ مەدینە کۆچی کرد. شەو بەرێگادا دەڕۆشت و رۆژ دەخەوت. کاتێك گەشتە مەدینە هەردو قاچی قەڵشابوو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: عەلی بێننە لای من. وتیان: ناتوانێت بەرێگادا بڕوات. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای و لەئامێزی گرت و بەمیهرەبانییەوە سەیری کرد چوونکە بینی قاچەکانی بەتەواوی ئاوساوە. تفی کردە دەستی خۆی و لەقاچەکانی عەلی سوو. دوای ئەوە عەلی تا رۆژی کوژرانی ئازاری قاچی

نەکێشا. عەلی لەمەدینە لای ژنێکی بێ مێرد دابەزی و بینی هەر شەو پیاوێك دێتە لای و شتێکی پێدەدات. ئەو لەژنەکە گوماندار و پرسی: ئەم پیاوە کێیە؟ ژن وتی: سەهل کوڕی حونەیف و چوونکە دەزانێت من هاوسەرم نییە، بتەکانی خەڵکەکەی خۆی دەشکێنێت و دەیهێنێت بۆ لای من و دەڵێت: بەمانە ئاگر بکەرەوە. عەلی دوای مردنی سەهل بەردەوام ئەم داستانەی دەگێڕایەوە.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆژی دوشەممە و سێشەممە و چوارشەممە و پێنج شەممە لەقبا مایەوە. دەستەیەك دەڵێن: زیاتر لەمە لای ئەوان مایەوە. و خوا زاناترە. پێغەمبەر(د.خ) کاتێك هەینی بینی کە لەناو منالەکانی سالم کوڕی عەوفدا بوو. ئەو نوێژی هەینی لەمزگەوتێك لەناو دۆڵەکە، بەجێهێنا. ئەمە یەکەم نوێژی هەینی بوو لەمەدینە خوێندی.

عەبدوڵڵە کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەڕۆژی دووشەممە چاوی بەدنیا هەڵهێنا، لەڕۆژی دووشەممە وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژێردرا، لەڕۆژی دووشەممە بۆ مەدینە کۆچی کرد و لەڕۆژی دووشەممە کۆچی دوایی کرد.

زاناکان سەبارەت بەدرێژی کاتی مانەوەی ئەو لەمەککە دوای هاتنی وەحی بەجیاوازی قسەیان کردووە. ئونس و عەبدوڵڵە کوڕی عەباس لەگێڕانەوەی عایشە و باوکی سەلەمە وتوویانە دەساڵ لەمەککە مایەوە. کوڕی موسەیب و حەسەن و عەمرۆ کوڕی دیناریش بەهەمان شێوە. دەستەیەك وتوویانە: سیانزە ساڵ. ئەم وتەیە لەکوڕی عەباس لەگێڕانەوەی باوکی جەمەرە و عێکرەمە سەرچاوەی گرتووە. لەوانەیە ئەو کەسەی ئاماژەی بەدەساڵ دابێت، مەبەستی بووە بڵێت: دوای ئاشکرا کردنی بانگەوازەکەی خۆی، دە ساڵ لەمەدینە مایەوە. ئەو چەند ساڵێك بەنهێنی خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان هاندەدا. ئەوەی ئەم وتە بەهێز دەکات، وتەی سێرمە کوڕی باوکی ئەنسی ئەنسارییە کەدەڵێت:

ثوي فى قريش بضع عشرة حجة      يذكر لو يلقى صديقا مواتيا

واتاکەی: پێغەمبەر(د.خ) دەساڵ و چەند ساڵ لەناو قورەیش مایەوە و خۆزگە هاوڕێیەکی هاوخەمی بۆ خۆی دەدۆزییەوە.

ئەم وتەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەو سیانزە ساڵ لەمەککە مایەوە چوونکە ئەم

وتاردەرە چەندی بەسەر دە زیاد کردووە. ئەگەر دەیویست پانزە یا شانزە یا حەفدە بڵێت، قسەکەی بەهێز دەبوو (خمس عشرە حجە، ست عشرە حجە، سبع عشرە حجە) بەڵام چوونکە مەبەستی قسەکەی بەسیانزە بەهێز نەدەبوو(ثلاث عشرە) دەساڵ و چەند ساڵی وت.

لەقتادە گێڕانەوەیەکی سەیر هەیە، دەڵێت: قورئان بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەمەککە بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەهاتەخوار. کەسیتر ئەم وتارەی پشت راست نەکردۆتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی یەکەمی کۆچی (٦٢٢)

یـەکێك لـەم ڕووداوانـە، کۆبوونـەوەی پێغەمبـەر(د.خ) لەگـەڵ هـاوەڵانی بـوو لەڕۆژێکی هەینیدا کەتیادا لەناوچەی قەبا لەمناڵەکانی سالم لەناو دۆڵێك ڕۆشتە لای ئەوان و نوێژی هەینی لەگەڵ ئەوان خوێند. ئەمە یەکەم هەینی بوو تیاییدا پێغەمبەر(د.خ) نوێژی هەینی خوێند و وتاریدا. ئەمەیش یەکەم وتاری هەینی لەمێژوی ئیسلامدا بوو.

ئەو لەقەبا هاتەدەر وهەوساری وشترەکەی خۆی بەرەڵا کرد. دەگەشتە ماڵی هەرکام لە ئەنسار، دەیانوت: ئەی پێغەمبەری خوا، لەزەویەیك کەلێوانلێو لەپیاوە شەڕەکەرەکان و سازوبەرگی بەرگری کردن، دابەزە. فەرمووی: ڕێگەی بۆ وەکەن چوونکە فەرمانی پێدراوە. سەرئەنجام گەشتە شوێنی مزگەوتی ئێستاکەی. ئەو ڕۆشتە درگای مزگەوت و لەسەر زەوی دانیشت. ئێرە ئاخوڕی مەڕی دوو کوڕی هەتیو بوو کە لەداوێنی موعاز کوڕی عەفرا گەورە پەروەردە دەبوون. ئەم دووانە، سۆهل و سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەمناڵەکانی نەجار بوون. کاتێك لەسەر زەوی دانیشت، پێغەمبەر(د.خ) دانەبەزی. ئەوسا هەستا و کەمێکیتر ڕۆشت و پێغەمبەر(د.خ) هەوسارەکەی بەردابوو و ڕێگەی لەجێگۆڕکێی ئەو نەدەگرت. وشتر ئاوڕێکی بۆ دواوە دایەوە و دواتر هەستا و دووبارە گەڕایەوە بۆ شوێنی یەکەمی و لەوێ کەوت سەرچۆك و سینەی لەسەر زەوی خەواند. پێغەمبەر(د.خ) دابەزی و باوکی ئەیوبی ئەنساری ساز وبەرگی وشترەکەی هەڵگرت.

پێغەمبەری خوا سەبارەت بەزەوی ئاخوڕەکە پرسیاری کرد، مەعز کوڕی عەفرا وتی: هی ئەو دوو کوڕە بێ باوکەیە کە لەماڵی مندا دەژین و من بەدانی بڕە پارەیەکی بەسندە، ئەوان ڕازی دەکەم. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا تالەوێ مزگەوتێك دروست بکەن. ئەو لای باوکی ئەیوبی ئەنساری مایەوە تا مزگەوتی ئەو و ماڵەکانی دروست کران.

دەستەیەك دەڵێن: زەوی مزگەوت، زەوی مناڵەکانی نەجار بوو کەتیایدا داری

خورما و کشت و کاڵیان دەکرد وئارامگای بوتپەرستان بوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەهای زەوییەکە لەمن وەربگرن و زەوییەکە بدەن بەمن. وتیان: لەبەرابەر زەوییەکە جگە لەپاداشتی خواییمان ناوێت. فەرمانیدا لەوێ مزگەوتێکیان دروست کرد. پێشتر لەهەر شوێنێك کاتی نوێژ دەهات، نوێژیان دەخوێند. ئەم مزگەوتە پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەنسار و کۆچکەران دروستیان کرد. ئەمە ڕاستە. لەم ساڵەدا مزگەوتی قەبا بناغەی دارێژرا.

لەم ساڵەدا کلسوم کوڕی هەدەم مرد. دوای ئەو ئەسعەد کوڕی زورارە سەروەری منداڵەکانی نەجار ماڵئاوایی لەجیهان کرد. منداڵەکانی نەجار کۆبونەوە و داوایان لەپێغەمبەر(د.خ) کرد سەروەرێکیان بۆ دیاری بکات. بەوانی وت: ئێوە برای منن و من سەروەری ئێوەم. ئەمە، بووە هۆی سەربڵندی و سەرفەرازی ئەوان. لەم ساڵەدا باوکی ئۆحەیحە لەتایف و وەلید کوڕی موغەیرە و عاس کوڕی وایلی سەهمی لەمەککە مردن و هەموویان لەسەر ئایینی بتپەرەستی بوون.

لەم ساڵەدا هەشت یا حەوت مانگ دوای هاتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە، لەزەیقەعدە (ئاوریل) یا شەوال) ئەو لەگەڵ عایشەدا خەوت. ئەو ساڵێك پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە، دوای مردنی خەدیجە لەشەش یا حەوت ساڵی عایشە ئەوی وەك هاوسەر هەڵبژاردبوو.

لەم ساڵەدا سەودە کچی زەمەعە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) و کچەکانی جگە لەزێنەب و هەروەها بنەماڵەی ئەبوبەکر هاوڕێ لەگەڵ کوڕەکەی عەبدوڵڵە و تەلحە کوڕی عوبەیداللە بۆ مەدینە کۆچیان کرد. هەروەها لەم ساڵەدا یەك مانگ دوای گەشتنی بۆ مەدینە، دوو ڕەکەعەت بۆ نوێژێکیتر (نوێژی عەسر) زیاد کرا. لەم ساڵەدا یا لەساڵی دووەم لە شەوال (فەوریەی ٦٢٤ زایینی)عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر لەدایك بوو. نەعمان کوڕی بەشیر یەکەم منداڵی ئەنسار دوای کۆچ کردنیان بۆ مەدینە بوو. دەستەیەك دەڵێن موختار کوڕی باوکی عوبەید و زیاد کوڕی ئومیە لەم ساڵەدا لەدایك بوون.

لەم ساڵەدا دوای حەوت مانگ لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە، ئالآیەکی سپی بۆ مامی حەمزە بەست و ئەوی کردە فەرماندەی دەستەیەك لەکۆچکەران تا بڕۆن و

ڕێگەی لەکاروانی قورەیش بگرن و سامان و دارایی ئەوان بەدەست بێنن. حەمزە چاوی بە ئەبوجەهل کەوت کەفەرماندەیی سێ سەد پیاو بوو. مەجدی کوڕی عەمرۆ جۆهەنی دوبەرەکی خستە نێوانیان. ئالا لەدەست باوکی مەرسەد دابوو. ئەمە یەکەم ئالایە پێغەمبەر(د.خ) بەستی. هەروەها لەم ساڵەدا ئالایەکی بۆ عوبەیدە کوڕی حارس کوڕی عەبدئەلموتەلیب بەست. ئالایەکی سپی بوو کەمەستەح کوڕی ئوساسە هەڵیدەگرت. ئەو چاوی بەبتپەرستان کەوت و شەڕی نێوان ئەوان تەنیا بەهاویشتنی تیر بوو نەبەشمشێر. سەعد کوڕی ئەبی وەقاس یەکەم کەس بوتیری لەڕێگەی خوادا هاویشت. مقداد کوڕی عەمرۆ و عوتبە کوڕی غەزەوان هەردووک موسوڵمان بوون و لەمەککە دەژیان. ئەم دووانە لەگەڵ بتپەرستان هاتنەدەر و ئەوانیان کردە بیانوی خۆیان و کاتێك موسوڵمانانیان بینی، پەیوەستیان بوون. دەستەیەك دەڵێن: ئالای باوکی عوبەیدە یەکەم ئالا بوو. ئەوانە لەبەر ئەوە تێکەلاو بوون چوونکە لەیەك نزیك بوون. سەرکردەی بتپەرستان ئەبو سوفیان کوڕی حەرب یا مێکرەز کوڕی حەفس کوڕی ئەخیەف یا عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل بوو.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) ئالایەکی بۆ سەعد کوڕی وەقاس بەست و ئەوی بەرەو (ئەبوا) ڕەوانە کرد. ئالاکە مقداد کوڕی ئەسوەد هەڵی دەگرت. ڕەوانە کرانی ئەو لەزیقەعدە بوو. هاوڕێیانی ئەو هەمووان لەکۆچکەران بوون. شەڕی نەکرد.

واقدی ئامارژەی بەهەمووی ئەم شەڕانە داوە کە لەیەکەم ساڵی کۆچ کردن ڕوویانداوە بەلام کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەساڵی دووەمدا ڕوویانداوە. دەڵێت: دوای دوانزە مانگ لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە، ئەو لەشار بەمەبەستی شەڕ ڕۆشتەدەر و سەعد کوڕی عیبادەی کردە جێگری خۆی لەمەدینە. ئەو گەشتە شوێنێك بەناوی (وەدان) و ویستی چاوی بەقوڕەیشییەکان و مناڵەکانی زومرە لەکەنانە بکەوێت. ئەمە هەمان شەڕی ئەبواد بوو و لەنێوان ئەم دوو شوێنە شەش میل ڕێگا. لێرە مناڵەکانی زومرە بەسەرکردایەتی مەخشیی کوڕی عەمرۆ بەئاشتی کۆتاییان بەبارودۆخەکە هێنا. ئەو بۆ مەدینە گەڕایەوە و زیانی بەرنەکەوت. کوڕی ئیسحاق دوای ئەم شەڕە ئامارژەی بە شەڕی عوبەیدە کوڕی حارس و بەدوای ئەو شەڕی حەمزە کوڕی عەبدئەلموتەلیب داوە.

هەروەها لەم ساڵەدا شەڕی بەوات ڕوویدا کەپێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەنجامدانی لەکۆتایی مانگی ڕەبیع ئەلثاني، واتا ساڵی دووەمی کۆچی (ئۆکتۆبەری ٦٢٣ زایینی) بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ قورەیشییەکان ڕۆشتەدەر و دووسەد پیاوی شەڕکەر لەهاوەڵانی هاوڕێیەتییان دەکرد. ڕۆشت تا گەشتە بەوات لەپانایییەکانی ڕەزوا. کاروانەکەی قورەیش ئومەییە کوڕی خەلەف جومەحی و سەد پیاوی شەڕکەر و دوو هەزار وپێنسەد وشتری لەگەڵدابوو. پێغەمبەر(د.خ) بێ شەڕ گەڕایەوە. ئاڵای پێغەمبەر(د.خ) لەدەست سەعد کوڕی ئەبی وەقاسدا بوو. ئەو سەعد کوڕی مەعازی کردە جێگری خۆی لەمەدینە.

لەم ساڵەدا لەجەمادی ئەلئەوەلی (نۆڤەمبەر) پێغەمبەر(د.خ) بۆ هێرشکردنە سەر قورەیشییەکان کەبەرەو شام دەڕۆشتن، ڕۆشتە یەنبەع و شەڕی عۆشەیرەی ئەنجامدا. کاتێك گەشتە عۆشەیرە، لەگەڵ منداڵەکانی مۆدلێج و هاوپەیمانەکانی لەمناڵەکانی زومرە ئاشتی کرد و بێ ئەنجامدانی شەڕ بۆ مەدینە گەڕایەوە. ئەو، باوکی سەلمە کوڕی عەبد ئەلئەسەدی کردە جێگری خۆی لەمەدینە و ئاڵاکەیدا بەحەمزە. لەم شەڕەدا بوو بەوتەی هەندێ کەس پێغەمبەر(د.خ)نازناوی (ئەبوتراب)ی بە عەلی بەخشی. هەروەها لەم ساڵەدا کورزی کوڕی جابری فیهری هێرشیکردە سەر گایەلی مەدینە.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتەدەر تا گەشتە دۆڵێك لەپانایی بەدر بەناوی سەفوان بەڵام کورزی کوڕی جابر هەڵات. ئاڵاداری ئەو عەلی کوڕی ئەبی تالی بوو. زەیدی کوڕی حارسی کردە جێگری خۆی لەمەدینە. هەروەها پێغەمبەر(د.خ) لەم ساڵەدا سەعد کوڕی وەقاسی لەگەڵ هەشت کەسدا بۆ شەڕ نارد کەبێ ئەنجامدانی شەڕ گەڕایەوە. هەروەها لەم ساڵەدا باوکی قەیس کوڕی ئەسلەت ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو پێشنیاری ئیسلامی پێکرد کەوتی: چەند خۆشە ئەوەی پێی دەخوێنی! لێم بێستە تا لەم کارە تێفکرم و بگەڕێمەوە. عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی لەدووڕووەکان بوو، چاوی پێیکەوت وتی: حەزت لەشەڕ لەگەڵ خەزرەجییەکان نەبوو، باوکی قەبیس وتی: تا یەك ساڵی تر باوەڕ بەئیسلام ناهێنم. ئەو لەزیقەعدەدا مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووەمی کۆچی ( ٦٢٣ زایین )

بەوتەی هەندێ لەنووسەرانی سەربوردەی پێغەمبەر(د.خ)، لەم ساڵەدا ئەو بۆ شەڕی ئەبوا ڕۆشتەدەر. دەستەیەك دەڵێن ودان بوو کەلەنێوان ئەم دووانە شەش میل ڕێگایە. پێغەمبەر(د.خ) سەعد کوڕی عوبادەی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا. ئالاکەی سپی و حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب هەڵیدەگرت. پێشتر ئاماژەمان پێدا.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر (ئوت) عەلی کوڕی ئەبی تالیب فاتمە کچی پێغەمبەری وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد.

## شەڕی عەبدوللە کوڕی جەحش

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی شەڕی بەباوکی عوبەیدەی جەراحدا و ئەو، خۆی بۆ شەڕی ئامادە کرد. کاتێك ویستی بەڕێکەوێت، لەودوری پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەگریان کرد و پێغەمبەر(د.خ) لەجیاتی ئەو لەجەمادی ئەلثانی (دێسامبەر)عەبدوللە کوڕی جەحشی لەگەڵ هەشت شەڕکەر لەکۆچکەران نارد. دەستەیەك دەڵێن ژمارەیان دوانزە کەس بوو. نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا سەیری نامەکە نەکات مەگەر ئەوەی دوو ڕۆژ ڕێگای بڕیبێت. ئەو کاتە نامەکە بخوێنێت و فەرمانەکانی ئەنجام بدات بەلاّم هیچکام لەهاوڕێکانی بەزۆر ناچار بەئەنجامدانی هیچ کارێك نەکات. ئەو کارەی کرد و نامەکەی خوێندەوە کە تیایدا فەرمان درابوو لەنەخلە لەنێوان تایف و مەککە دابەزێت و بۆسە بۆ قورەیشییەکان بنێتەوە و چاوەڕوانی هەواڵەکانی ئەوان بێت. ئەو هاوڕێکانی خۆی لەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار کردەوە و هەموویان لەگەڵ ئەودا بەڕێکەوتن. سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و عوتەبە کوڕی غەزوان وشترەکانی خۆیان ون کرد و بەدوایدا گەڕان. عەبدوللە ڕۆشت و لەنەخلە دابەزی. کاروانی قوریشیەکان کەباری کشمیش و شتی تریان پێبوو، لای ئەوانەوە تێپەڕین و ئەم کەسانە لەگەڵیاندا بوون: عەمرۆ کوڕی

حەزرەمی، عوسمان کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی موغەیرە، براکەی نەوفل و حەکەم کوڕی کەیسان. لەم کاتەدا عوکاشە کوڕی میحسەنی سەرتاشراو ڕۆشتە لایان و کاتێك کاروانییەکان ئەویان بینی، وتیان، دەچن بۆ حەجی عەمرە و زیان لەئێوە نادەن. ئەمە لەرۆژی کۆتایی رەجەب ٢٧ ژانویەی ٦٢٤ زایینی ڕوویدا. واقد کوڕی عەبدوڵڵە تەمیمی تیری بۆ عەمرۆ کوڕی حەرەمی هاویشت و دەستبەجێ ئەوی کوشت. عوسمان کوڕی عەبدوڵڵە و حەمم کوڕی کەیسان ئەسیر کران ونەوفل کوڕی عەبدوڵڵە هەڵات وموسوڵمانان سامانی کاروانەکەیان وەك تالآنی هەڵگرت. عەبدوڵڵە کوڕی جەحش وتی: پێنج لەسەر یەك لەوەی بەتالآنیتان گرتووە، هی پێغەمبەرە، ئەمە پێش ئەوە بوو فەرمانی پێنج یەك لەلایەن خواوە بێت. ئەمە یەکەم تالآنی بوو موسوڵمانەکان بەدەستیان هێنا و یەکەم پێنج لەسەر یەك بو بە پێغەمبەر(د.خ) درا.

عەبدوڵڵە کوڕی جەحش و هاورێکانی لەگەڵ کاروان و کاروانییەکان و ئەسیرەکان بۆ مەدینە گەڕانەوە. کاتێك گەشتن، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من فەرمانی شەڕم بەئێوە لەمانگی حەرام نەدابوو. دەستی بەسەر کاروان و دوو ئەسیرەکەدا گرت. شەڕکەران شڵەژان و موسوڵمانەکان ئەوانیان سەرکۆنە کرد و قورەیشییەکان وتیان: محەممەد و هاوەڵانی ڕێزیان لەمانگی حەرام نەگرت. جوولەکەکان بەمشێوە فاڵی خراپیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) لێدا کە: ((عەمرۆ کوڕی حەزرەمی عەبدوڵڵە کوڕی واقد کوشتی)). عەمرۆ ئەوەیە کەشەڕ ڕوویدا (عمرت الحرب)، حەزرەمی ئەوەیە کەکاتی شەڕ گەشت (حضرت الحرب) و واقد ئەوەیە کەئاگری شەڕ بڵێسەی سەند (وقدت الحرب). لەم کاتەدا خوا ئەم ئایەی نارد: سەبارەت بەمانگی حەرام، ئەو مانگەی شەڕ تیایدا حەرامە، پرسیار لەتۆ دەکەن. بڵێ: شەڕکردن تیایدا قورس و گرانە و ڕێگرتنێکە لەڕێگای خواوەند و نباوەڕی ئەو و مەزگەوتی پیرۆز. بەلآم دەرکردنی خەڵکەکەی لەوێ (دەرکردنی پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە) لەم کارە گەورەتر و ناڕەواترە و ئاژاوە ناڕەواترە لەکوشتار. بتپەرستەکان شەڕ لەگەڵ ئێوەدا دەکەن تا ئەگەر بتوانن ئێوە لەئایینەکەی خۆتان بگەڕێننەوە. هەرکام لەئێوە لەئایینەکەی خۆی بگەڕێتەوە و ناباوەڕ بمرێت، لەم دنیا و لەو دنیا کارەکانیان هەڵگڕاوە دەبێت و بۆ هەمیشە

لـەئاگردا دەسـوتێن (بقـره / ٢/٢١٧). کاتێـك قورئـان دابـەزی و خـوا هاوکـاری موسـوڵمانانی کـرد بـۆ چارەسـەر کردنـی ئـەم بابەتـە، پێغەمبـەر(د.خ) کاروانەکـەی هـەڵگرت وئەمـە یەکـەم تـاڵانی بـوو دەست موسـوڵمانەکان کـەوت. پێغەمبـەر(د.خ) لەبەشـی خـۆی بـەهای ئـازادی دوو ئەسـیرەکەی دا و حەکـەم کـوڕی کەیـسان لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە تا لەشەڕی بئر مەعونە گیانی بەخشی.

دەستەیەك دەڵێن: کوشتنی عـەمرۆ کوڕی حـەزرەمی و گـرتنی کـاروان لـە دوایین رۆژی جـەمادی ئەلئـەوەل و یەکـەم شـەوی رەجـەب ٢٩ دیـسامبەر ٦٢٣ زایـینی روویدا.

لەم ساڵەدا قیبلەی نوێـژی موسوڵمانان لەشامەوە رووێکردە کەعبە. یەکەم جار کە نوێـژکردن روو لەقیبلـە پێویست کـرا، ئـەو کاتـە بـوو کەپێغەمبـەر(د.خ) لەمەککە بوو. حەزی دەکرد روو لەقیبلە بکات و نوێژ بخوێنێت. ئەو لەمەککە بەشێوەیەك بۆ نوێژ دەوەستا کەکەعبە لەنێوان ئەو و بـەیت ئەلموقەدەسدا بێت. کاتێك بۆ مەدینە کۆچی کـرد نـەیتوانی ئـەم کـارە بکـات( چوونکە مەککـە لەپـشت سـەرییەوە بـوو). ئارەزووی دەکرد بۆ کەعبـەی بگەرێننـەوە. خـوا لـەرۆژی سێشەممە نیـوەی شـەعبان دوای هـەژدە مـانگ لـەهاتنی ئـەو بـۆ مەدینـە (٢٦ فەوریـەی ٦٢٤ زاییـنی) فـەرمانی پێـدا روو لەکەعبـە نوێـژ بکـات. هەنـدێك دەڵـێن دوای شـانزە مـانگ لـەکاتی نوێـژی نیمەڕۆدابوو.

هـەروەها لـەم سـاڵەدا لەشـەعبانی / فەوریـەی ٦٢٤ زایـینی رۆژو گـرتنی مـانگی رەمـەزان پێویـست کـرا. کاتێك هاتـە مەدینـە، جوولەکـەکانی بینی لـەرۆژی عاشـورا رۆژو دەگـرن. لەبـەر ئەمـە فـەرمانی رۆژوو گرتنیـدا. کاتێـك رۆژو گـرتنی مـانگی رەمەزان پێویست کرا، نە ئـەوانی بـۆ رۆژو گـرتنی رۆژی عاشـورا فەرمانـدا نەرێگـەی لێگرتن.

لـەم سـاڵەدا پێغەمبـەر(د.خ) فـەرمانی بەخەڵکـدا یـەك یـا دوو رۆژ پـێش جـەژنی رەمەزان، زەکاتی رۆژو لەسامانی خۆیان بدەن. لەم ساڵەدا پێغەمبـەر(د.خ) رۆشتە نوێژگـەی دەرەوەی شـار و نوێـژی جـەژنی لەگـەڵ خەڵکـدا خوێنـد. ئەمـە یەکـەم جار بوو لەمێژووی ئیسلام کـەبۆ نوێـژ دەرۆشـتە دەرەوەی شـار و رمـی بچوك لەبـەردەم

ئەودا هەڵدەکرا. ئەم ڕمە، هی نەجاشی پاشای حەبەشە بوو کە بەزوبەیر کوڕی عەوامی بەخشیبوو. ئەمڕۆکە ئەو ڕمە لەدەست بانگدەرانی مەدینەیە.

## شەڕی گەورەی بەدر

لەساڵی دووەمی کۆچی ڕۆژی هەینی حەفدە یا نۆزدەی ڕەمەزان ١٤ یا ١٦ مارسی ٦٢٤ زایینی، شەڕی گەورەی بەدر دەستی پێکرد. هۆکاری ئەم شەڕە کوژرانی عەمرۆ کوڕی حەزرەمی و گەشتنی ئەبو سوفیان کوڕی حەرب لەگەڵ کاروانی گەورەی قورەیشییەکان لە شامەوە بۆ مەککە بوو. کاروانی سامانەکانی ئەوان زۆر و سی یا چل یا حەفتا پیاو لە قورەیش لەگەڵیا بوون. لەناویاندا ئەم کەسانە دەبینران: مەخرەمە کوڕی نەوفل زۆهری و عەمرۆ کوڕی عاس. کاتێک پێغەمبەر(د.خ) هەواڵی هاتنی کاروانەکەی بیست، موسوڵمانەکانی بۆ گرتنی هاندا و وتی: ئەمە کاوانی قورەیشە کەسامانی ئەوانی تیایە. هێرشیبکەنەسەر بەڵکو خوا ڕۆژیتان پێ بدات. خەڵك ڕوویان لەشەڕ کرد، هەندێك بار سوك و هەندێك گران بار. ئەمە لەبەر ئەوە بوو کەگومایان نەدەکرد پێغەمبەر(د.خ) گرفتاری شەڕ بێت.

ئەبوسوفیان بیستی کەپێغەمبەر(د.خ) مەبەستی کاروانەکەی کردووە. ئاگادار بویەوە و زەمزەم کوڕی عەمرۆ غەفاری بەکرێ گرت و ناردی بۆ مەککە تا قورەیشییەکان ئاگادار بکاتەوە و ئەمان ڕزگار بکەن. زەمزەم بەرەو مەککە ڕۆشت. عاتکە کچی عەبدولموتەلیب سێ ڕۆژ پێش گەشتنی زەمزەم بۆ مەککە، خەوێکی بینی کە بەتەواوی پەرێشانی کرد. ئەو خەوەکەی بۆ براکەی عەباس گێرایەوە و داوای لێکرد بەنهێنی بیهێڵێتەوە. ژن وتی: لەخەودا بینیم سوارێك لەسەر وشترێك هات تا گەشتە شوێنی لافاو و بەبەرزترین ئاوازی خۆی هاواری کرد: ئەی مناڵەکانی غودەر تا سێ ڕۆژیتر بەرەو کوشتنگەی خۆتان بڕۆنەدەر. بینیم کەخەڵك دەوری ئەویان گرتووە. ئەو ڕۆشتە ناو مزگەوت و وشترەکەی خۆی لەناو کەعبەدا دانا و بەدەنگی بەرزهاواری کرد و وتەکانی دووبارە کردەوە. دواتر وشترەکەی بردە سەر لوتکەی چیای ئەبو قەبیس و بەدەنگی بەرز هاواری کرد. دواتر

تاشەبەردێکی گەورەی هەڵگرت و فڕیدایە خوار، کاتێك گەشتە خوار چیاکە لەت لەت بوو و هیچ ماڵێك لەمەککەدا نەما مەگەر ئەوەی لەتە بەردێك کەوتە ناو ماڵەکەیەوە.

عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب هاتەدەر و چاوی بەوەلید کوڕی عوتەبە کوڕی ڕەبیعە کەوت و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە و داوای لێکرد لای کەس باسی نەکات. وەلید بۆ باوکی باس کرد و داوای لێکرد بۆ کەسی نەگێڕێتەوە. ئەم خەوە لەشاردا بڵاو بویەوە. ئەبوجەهل چاوی بەعەباس کەوت و وتی: ئەی ئەبولفەزل، وەرە بۆ لای ئێمە. دەڵێت: کاتێك بەدەوری ماڵی خوادا سوڕامەوە، ڕۆشتمە لای. ئەبوجەهل پێی وتم: ئەم پێغەمبەرە ژنە کەی لەناو ئێوەدا دەرکەوت؟ ئەو ئاماژەی بەخەوی عاتیکەدا و وتی: بەمە ڕازی نەبوون پیاوەکانتان بوون بەپێغەمبەر، ئێستا ژنەکانتان بوونە پەیام هێنەر! ئێستا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لای ئێوە خۆڕاگری دەکەم و چاودێری ئێوە دەکەم. ئەگەر خەوەکە ڕاست بێت چ باشتر و گەرنە دەنووسم کەئێوە درۆزنترین بنەماڵەی عەرەبن.

عەباس دەڵێت: من لەبەرابەر ئەوهیچم نەکرد جگە لەوەی بەدرۆم زانی و وتم ئاگام لەهیچ شتێك نییە. کاتێك ڕۆژم کردە شەو، ژنانی عەبدولموتەلیب هاتنە لای من و وتیان: ڕێگەتان بەم پیاوە خراپەداوە، بەخراپی ناوی پیاوەکانی ئێوە بدات و ئێستا هاتووە و ژنەکانتان بەخراپەکار ناودەبات و ئێوە هیچ ناڵێن. دەڵێت: وتم: سوێند بەخوا بەمشێوە دەبێت. من ئەو سزا دەدەم و ئەگەر جارێکیتر ئەم کارە دووبارە بکاتەوە، ئەو بەسزاکەی دەگەیێنم. بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەم لەخەوی عاتکە لەماڵ هاتمەدەر و تووڕەیی لەسەرمدا گێنگڵی دەخوارد وحەزم دەکرد چاوم بەئەبوجەهل بکەوێت. ئەوم لەمزگەوت بینی وبەرەولای ڕۆشتم تا قسەی لەگەڵ بکەم وئەو بەتوندی وەڵامم بداتەوە و سزای بدەم. بینیم بەخێرایی بەرەو درگای مزگەوتەکە دەڕوات. بەخۆم وت: خوا بیکوژێت، چی بەسەر هاتووە. هەمووی ئەمە لەترسی ئەوەیە کە جنێوبارانی بکەم. لەناکاو بینیم ئەویش هەمان ئاوازی بیستووە کەمن بیستم. دەنگی خرۆشاوی زەمزەم کوڕی عەمرۆ بو کەلەناو دۆڵەکەوە هاواری دەکرد.( ئەو بەهەمان شێوە عاتیکە لەخەودا بینیبووی) سوار لەسەر وشتر بوو،

لوتی وشترەکەی بڕیبوو، کۆپانی وشترەکەی هەڵگەراندبویەوە و یەخەی خۆی دریبوو و بەردەوام هاواری دەکرد: ئەی قوڕەیشییەکان، کاروان، کاروان! سامانەکەتان لەدەست ئەبوسوفیانە و محەممەد و هاورێکانی ڕێگەیان لێ گرتووە. گومان ناکەم بیانبیننەوە. ئەی هاوار! ئەی هاوار! فریا کەون، فریا کەون.

بینیم ئەبوجەهل گرفتاری ئەو شتە بووە کەمن گرفتاری بوم.

دەڵێت: خەڵك بەخێرایی خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد و لەگەورەکانیان جگە لەئوبەلەهەب کەسیان دانەنیشت کە ئەو عاس کوڕی هەشام کوڕی موغەیرەی لەجیاتی خۆی نارد. ئومەییە کوڕی خەلفی جومەحی ویستی نەڕوات چوونکە پیرەپیاوێکی قورس و قەڵەو بوو. عەقەبە کوڕی باوکی موعیت ئاگردانێکی پڕئاگری هێنایە لای و کەمێك بخوردی تێکرد و وتی: ئەی باوکی عەلی، بۆنی بخور بکە کەتۆ لەژنانی. وتی: خوا تۆ لەگەڵ ئەوەی هێناوتە ناشیرین بکات! ئەو ساز وبەرگی شەڕی هەڵگرت و بەرێکەوت و هاورێیەتی قوڕەیشییەکانی کرد. عوتەبە کوڕی ڕەبیعەیش ویستی نەچێت بەڵام براکەی شیبە پێی وت: ئەگەر خەڵکەکەمان خۆیانمان لێ دووربخەنەوە، ئەمە دەبێتە هۆکاری شەرمی ئێمە. لەگەڵ خەڵکەکەی خۆتا بڕۆ. لەگەڵ ئەوان ڕۆشت.

کاتێك لەسەر ڕۆشتن ڕێککەوتن، ڕقی کۆنی خۆیان لەگەڵ مناڵەکانی بەکر کوڕی عەبد مەنات کوڕی کەنانە کوڕی حارس بیرهێنایەوە و ترسان ئەوان لەپشتەوە هێرشیان بکەنەسەر. ئیبلیس لەڕوخساری سوراقە کوڕی جوعشەم ئەلمودلەجی لەگەورەکانی کەنانە ڕۆشتە لایان و وتی: من هاوپەیمانی ئێوەم، بەپەلە بڕۆن. ئەوان نۆسەد و پەنجا یا هەزار پیاوی شەڕکەر بوون. سەد ئەسپیان پێبوو کەحەفتا ئەسپیان رزگاری بوو و سی ئەسپی کەوتە دەست موسوڵمانان. بتپەرستەکان حەوتسەد وشتریان پێبوو.

بەرێکەوتنی پێغەمبەری خوا دوای سێ شەو لەمانگی ڕەمەزان ٢٨ فەوریەی ٦٢٤ زایینی بوو. سێسەد و سیانزە پیاوی شەڕکەر هاورێیەتیان دەکرد. دەستەیەك دەڵێن: زیاتر لەسێسەد و چواردە یا هەژدە یا دە و چەند کەس بوون. لەناویاندا حەفتا وحەوت یا هەشتا و سێ کەس لە کۆچکەران و ئەوانیتری لەئەنسار بوون.

دەڵێن: هەمووی ئەوانەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕ دیاری کردن، هەشتا و سێ کەس لەکۆچکەران، حەفتاو یەك کەس لە ئەوس و سەد و حەفتا کەس لەخەزرەجییەکان بوون. لەناو ئەواندا تەنیا دوو سوار دەبینرا: مقداد کوڕی عەمرۆ کەندی ( کەلەبوونی ئەو گومان نییە) و زوبەیر کوڕی عەوام یا مەرسەد کوڕی باوکی مەرسەد. دەستەیەك دەڵێن: تەنیا مقداد ئەسپی پێبوو. حەفتا وشتریشیان پێ بوو. شێوەی سوار بوونی ئەوان بەو شێوە بو کەدوو یا سێ یا چوار پیاو بەنۆرە سوار وشتر دەبوون.

پێغەمبەر(د.خ) و عەلی و زەید کوڕی حارسە یەك وشتریان و ئەبوبەکر و عومەر و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف یەك وشتر. کەسانیتریش بەم شێوە. ناوی ئەسپەکەی مقداد (سەبحە) و ناوی ئەسپەکەی زوبەیر (سیل) بوو. ئالأکەی ئەو لەدەست موسعەب کوڕی عومەیر کوڕی عەبدولدار و ئالأکەی هاورێ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب. فەرماندەی دواوەی سوپاکەی قەیس کوڕی باوکی سەعسەعەی ئەنساری بوو.

کاتێك گەشتنە نزیك سەفرا ، بەسبەس کوڕی عەمرۆ و عودەی کوڕی باوکی زەغبا (هەردووك جوهنی) نارد تا هەواڵی ئەبوسوفیانی بۆ بێنن. ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت و سەفرای لەلای چەپەوە بەجێهێشت. بەسبەس کوڕی عەمرۆ گەشت و وتی کاروان گەشتۆتە نزیکی بەدر. پێغەمبەر(د.خ) و موسڵمانان ئاگادار نەبوون شوێنی قوڕەیشییەکان بۆ پارێزگاری کردن لەکاروانەکەیان کوێیە. عەلی و زوبەیر و سەعدی نارد تا هەواڵی بەدری بۆ بێنن. ئەوان ئاوهێنەرە قوڕەیشییەکانیان هێنا کەلەناو ئەواندا ئەسلەم کۆیلەی منالەکانی جەحجاح و باوکی یەسار کۆیلەی منالەکانی یعاسی لەناویاندا دەبینران. کاتێك ئەوانیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) کەنوێژی دەخوێند. لەوانیان پرسی و وتیان: ئێمە ئاوهێنەرانی قورەیشین و ئێمەیان بەرێکرد تا ئاویان بۆ بەرین. ئەوان ئەم وەلأمەیان پەسەند نەکرد و لێیاندان تا باسی ئەبو سوفیان بکەن. وتیان: ئێمە کۆیلەی ئەبو سوفیانین. ئەوانیان بەرەلا کرد. پێغەمبەر(د.خ) لەنوێژ تەواو بوو، وتی: ئەگەر ئەم دووانە راست بڵێن لێیان دەدەن و ئەگەر درۆ بکەن بەرەلأیان دەکەن. راستیان کرد ئەوان

کۆیلـەکانی قورەیـشن. پـێم بڵـێن: قورەیـشییەکان لـەکوێن؟ وتیـان: لەپـشت ئـەو تەپۆڵکـەوەن کـەدەیبینی، لەولایـەوەن. پێغەمبـەر(د.خ) پرسـی: ژمارەیـان چـەندە؟ وتیـان: زۆر. پرسـی: کەلوپـەلی شـەڕ چـەنیان پێیـە؟ وتیان: نـازانین. پرسـی: رۆژی چەند وشتر سەر دەبڕن؟ وتیان: رۆژێك نۆ و رۆژێك دە. فـەرمووی: نۆسـەد تـا هـەزار پیاوی شەڕکەریان لەگەڵدایە.

دواتـر بەودووانـەی وت: لەگـەورەکانی قـورەیش کـێ لـەناو سـوپاکەدایە؟ وتیـان: عوتەبـە و شـیبە کـوڕانی رەبیعـە، و وەلیـد، ئـەبو بەختـەری کـوڕی هوشـام، حـەکیم کوڕی حەزام، حارس کوڕی عامر، تەعیمە کوڕی عودەی، نەزر کوڕی حارس، زەمعـە کوڕی ئەسوەد، ئەبوجەهل، ئومەییە کوڕی خەلەف، نەبیە و مونەبە کوڕانی حـەجاج، سوهەیل کوڕی عەمرۆ عەمرۆ کوڕی عەبدود.

پێغەمبـەر(د.خ) ڕوویکـردە هـاوەڵانی خـۆی و وتـی: ئێـستا ئەمـە مەککەیـە لەتـە جەرگـەکانی خـۆی بـۆ ئێـوە دەهاوێـت. دواتـر لەسـەر چۆنییەتی شـەڕ کـردن لەگـەڵ هاوەڵانی خـۆی راوێـژی کـرد. ئەبوبـەکر هەسـتا و قسەی چاکی کـرد و عومـەر هاتـە قسە و بەهەمان شێوە. دواتـر مقداد کـوڕی عـەمرۆ هەسـتا و وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خوا، گوێ لەفەرمانی خواکەت بگرە کەئێمە لەگەڵ تۆداین. سوێند بەخوا ئێمە ئـەوە ناڵێین کـەمناڵانی ئیـسرائیل بەموسـایان وت: تـۆ و خواکـەت بـڕۆن و هـەردووك شـەڕ بکەن کەئێمە لێرەدا دانیشتوین ((مائـدە /٥/٢٤)). ئێمـە دەڵـێین: تـۆ لەگـەڵ خواکـەت بـڕۆ و هـەردووك شـەڕ بکـەن کەئێمـە هـاوڕێ لەگـەڵ ئێـوە شـەڕ دەکـەین. سـوێند بـەو کەسـەی تـۆی بەراسـتی و دروسـتی نـاردووە، ئەگـەر ئێمـە تـا زۆنکـاوی غیمـاد (حەبەشە) غاربدەیت، لەگەڵ تۆدادێین تا بەوێ بگەیت.

ئـەو لـەخوا بـۆ ئـەوان پاڕایـەوە. دواتـر پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: ئـەی خەڵکینـە، بۆچوونی خۆتـان لەگـەڵ منـدا بـاس بکـەن. مەبەسـتی ئەنـسار بـوو چـوونکە ئـەوان زۆربـەی سـوپاکەی ئـەویان پێکدەهێنا. ترسـا ئەنـسار تـەنیا هاوکـاری کردنـی ئـەو لەبەرابەر دوژمن و خراپەخوازانی ناو مەدینە بەپێویست بزانن و پێیان ڕەوا نـەبێت بۆ شەڕ لەدەرەوەی مەدینە بیانبەن. سەعد کوڕی مەعاز وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، وا هەسـت دەکـەم مەبەسـتت ئێمەیـە. وتـی: بـەڵێ. سـەعد وتـی: ئێمـە شـوێن تـۆ

کەتووین و تۆمان بەراستگۆ زانی و پەیمانمان لەگەڵ تۆدا بەستووە. کەواتە ئەی پێغەمبەر(د.خ) گوێ لەفەرمانی خواکەت بگرە، سوێند بەو کەسەی تۆی بەراستی ناردووە ئەگەر تا ناو دەریا بمانبەیت و لەدەریا بدەیت، تا ناو شەپۆلەکانی دەریا لەگەڵ تۆدا دێین. ئێمە لەشەڕ خۆڕاگرین و لەڕووبەڕووبونەوەی دوژمن راست کردار. هیوادارم خوا بەجۆرێك ئێمە نیشانی تۆ بدات تا بەرچاوت ڕوون ببێتەوە. ئێمە بۆ بەرەکەتی خوایی ڕەوانە فەرموو.

پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت و وتی: موژدەدتان پێ دەدەم کە خوا یەکێك لەم دوودەستەی بە من بەخشیوە (کاروان یا سوپاکە: گرتنی کاروان یا زاڵبوون بەسەر ئەوان) دەڵێی هەرئێستا سەیری کوشتنگەی ئەم خەڵکە دەکەم. ئەوکاتە پێغەمبەر(د.خ) بەرەو بەدر سەرەوخوار بویەوە و لەنزیك ئەوێ دابەزی.

لەم ناوەدا ئەبوسوفیان بەدری بەرەو لای چەپ بەجێهێشتبوو. ئەو بەپەلە رۆشت و خۆی ڕزگار کرد. کاتێك بینی دارایی و سامانی خۆی رزگار کردووە، پەیك و پەیامی بۆ لای قوڕەیشییەکان نارد ( کەلەجەحفە بون ) و وتی: خواوەند کاروان و سامانەکەی ئێوەی رزگار کردووە، بگەڕێنەوە. ئەبوجەهل کوڕی هوشام وتی: سوێند بەخوا ناگەڕێمەوە تا بڕۆینە سەرزەمینی بەدر( بەدر شوێنێك بو عەرەبەکان هەر ساڵ بازاڕیان لێ دروست دەکرد) و سێ رۆژ لەوێ بمێنینەوە و مەڕ و شتر سەر ببڕین و بخۆینەوە وعەرەبەکان ئاوازی ئێمە ببیستن و بەردەوام بۆ هەمیشە ترسی ئێمەیان لەدڵدا بێت. ئەخنەس کوڕی شەریقی سەقەفی (کە هاوپەیمانی مناڵەکانی زۆهرە بوو وئەوان لەجەحفە بوون) بەکەسەکانی، مناڵەکانی زۆهرەی وت: ئەی مناڵەکانی زۆهرە: خوا سەرپەرەست و سامانەکەی ئێوەی رزگار کردووە، بگەڕێنەوە. ئەوان گەڕانەوە. هیچ کەس لەزۆهرییەکان و عەدەوییەکان لەشەڕی بەدەر بەشداریان نەکرد. بنەماڵەکانی دیکەی قورەیش بەشداریان کرد.

کاتێك قوڕەیشییەکان لەجەحفە بوون، جوهەیم کوڕی سەڵت کوڕی مەخریمە کوڕی موتەلیب کوڕی عەبد مەناف خەوێکی بینی و بەم شێوە گێڕایەوە: بەهەمان شێوە کەبینەران لەخەودا دەبینن، واهاتە بەرچاوم کەپیاوێکی سوارە بەسەر ئەسپ کەوشترێکی بەدوای خۆیدا رادەکێشا، گەشت و وتی: عوتەبە، شیبە، ئەبوجەهل (

و ئـەو کەسـانەیتر کەلەبـەدەر لەناوچـوون) کـوژراون. بینـیم کەشـتێکی هاوشـێوەی کێردی لەسینەی وشترەکەی خۆیدا و دواتر ئەوی لـەناو سوپاکە بەرەڵا کرد. هیچ خێوەتێـك نـەما مەگـەر ئـەوەی پەڵـەخوێنی وشترەکەی بەرکـەوت. ئەبوجـەهل وتـی: ئەمـەیش یـەکێك لـە پێغەمبـەرەکانی مناڵـەکانی موتەلیبـە. بـەیانی دەزانرێـت کـێ کوژراوە. لەنێوان تالیب کوڕی ئەبی تالیب و یـەکێکیتر لـە قوڕەیشییەکان کێشەیەك ڕوویدا وئەوان وتیان: سوێند بەخوا پێشتر دەمانزانی دڵتان لای محەممـەدە. تالیب لەگەڵ دەستەیەکیتر بۆ مەککە گەڕایەوە. دەڵێن: ئەو بەناچار هاتبووەدەر. ئەو نـە لـەناو ئەسـیراندا بینـرا و نـە لـەناو کـوژراوان و نـە لـەناو ئـەو کەسـانەی بـۆ مەککـە گەڕانەوە. ئەوە کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| یا رب اما یغزون طالب | فی مقنب من هذه المقانب |
| فلیکن المسلوب غیر السالب | و لیکن المغلوب غیر الغالب |

واتاکـەی: ئـەی خـوا، ئەگـەر وابێـت تالیـب وەك سـوارێك بکەوێتـە نـاو سـوارە شەڕکەرەکان، باشترە تالان کراو بێت نە تالانکەر و تێکشکاو بێت نە سەرکەوتوو.

قوڕەیشییەکان بەرێکەوتن و لەقەراغەکانی دوورتری ئەو دۆڵە دابەزین. خواوەنـد بـارانی ئاسمـانی ڕەوانـە کـرد. ئـەو دۆڵـە نـەرم و وردە بـەردی زۆری تیـا نـەبووو. پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی لەباران ئەوەیان پێگەشت کە زەوی کـەمێك بـۆ تـەڕ کـردن و ڕێگـەی ڕۆشـتنی لێنـەگرتن. بـەڵام قوڕەیـشییەکان لـەباران ئـەوەیان پێـبڕا کەنـەیانتوانی بـەرێگادا بـڕۆن. پێغەمبـەری خـوا هـات و پـێش ئـەوان خـۆی بـەئاو گەیانـد. کاتێـك گەشـتە نـزیکترین شـوێنی ئاوەکـە، حوبـاب کـوڕی مـونزەر کـوڕی جەموح پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئەمە ئەو شوێنەیە کەفەرمانی خوای لەسـەرە و نـاتوانین بـۆ پـێش و دواوە بـڕۆین یـا فـەرمانی شـەڕ و جـەنگ و فێـڵ لەئارادایە. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: فەرمانی جەنگ و فێڵ لەئارادایە. حوباب کوڕی مـونزەر وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا: ئەگـەر بەمـشێوەیە، شـوێنی تـۆ لێـرە نییـە. هەستە با بڕۆینـە شـوێنێك تـا لەبەرابـەر ئـەوان لای نـزیکیترین ئـاو دابـەزین و دواتـر چـاڵە کۆنـەکانی پـشت سـەری ئـەوان کـوێر بکەینـەوە و لەسـەرەوەی، ئاوبەسـتێك

دروست بکەین و ئاو کۆبکەینەوە تا ئێمە بخۆینەوە و ئەوان دەستیان پێی نەگات و لەم کاتەدا شەڕیان لەگەڵ بکەین. پێغەمبەر(د.خ) ئەو کارەی کرد.

کاتێك دابەزی، سەعد کوڕی مەعاز ڕۆشتە لای و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، فەرمانێك بدە تا بۆتۆ لەلقی خورما سایەوانێك دروست بکەین تا لەناویدا بیت و ئەسپ و وشترەکەی تۆ لەنزیك خۆتەوە ببەستینەوە. ئەگەر خوا ڕێزی لێگرتین و بەسەر ئەواندا زاڵی کردین، ئەوەیە دڵمان دەیخوازێت وئەگەر بەپێچەوانەوە بێت، بەپەلە سوار ئەسپ یا وشترەکەت دەبیت و خۆت بەخەڵکەکەمان دەگەیەنێت کەلەپشت سەرمانن. لەم شەڕەدا کەسانێك بەشداریان نەکردووە کەئێمە زیاتر لەوان تۆمان خۆش ناوێت. ئەگەر ئەوان گومانی شەڕیان بکردایە، بەشدارییان دەکرد. خوا تۆ لای ئەوان بپارێزێت وئەوان هەموو چاکەخوازی تۆ بن و لەگەڵ تۆدا شەڕ بکەن. پێغەمبەر(د.خ) سوپاسی کرد. دواتر سایەوانێکیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) دروست کرد. لەم کاتەدا قوڕەیشییەکان لەخۆباییانە گەشتن. کاتێك ئەوانی بینی، وتی: خواوەندا، ئەوانە قوڕەیشییەکانن کە لەخۆباییانە لەرێگاوە گەشتن تا شەڕی تۆ بکەن و پێغەمبەرەکەت بەدرۆینە لەقەڵەم بدەن. خودایە، هاوکاری خۆت بەمن بگەیێنە کەموژدەت پێ داوم. خواوەندا، بەرەبەیانی سبەی لەناویان ببە. عوتبە کوڕی شیبەی لەسەر وشترێکی سور بینی و وتی: ئەگەر لای یەکێك لەم خەڵکانە چاکە هەبێت، لای خواوەندی ئەو وشترە سوورەیە کەئەگەر فەرمانی لێ ببەن، بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی دەکرێن.

لەم کاتەدا خوفاف کوڕی ئیمە کوڕی ڕەحزەی غەفاری یا باوکی ئیمە لەکاتی تێپەر کردنی قوڕەیشییەکان لای ئەو، کوڕەکەی خۆی لەگەڵ چەند وشتری قوربانی بۆ لای قورەیش نارد ووشترەکانی پێشکەشی ئەوان کرد و هاوکاری کردن بەپیاوانی شەڕکەر و کەرەستەی شەڕی بەوان پێشنیار کرد. قوڕەیشییەکان وتیان: ئەگەر لەگەڵ خەڵکان شەڕ دەکەین، لاوازیمان نییە و ئەگەر محەممەد گومان دەکات لەگەڵ خوا شەڕ دەکەین، کەس توانای خۆراگری لەبەرابەر خوای نییە. کاتێك قوڕەیشییەکان هاتن، دەستەیەك لەوان وەك حەکیم کوڕی حوزام هاتنەسەر و گەشتنە ئاوبەستەکەی پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) وتی: وازیان لێ بێنن. ئەوان

هاتن و ئاویان خواردەوە. هەر کەس لەو ئاوەی خواردەوە، لەو ڕۆژەدا کوژرا جگە لە حەکیم کوڕی حوزام کە سوار ئەسپەکەی خۆی بەناوی (وەجیە) هەلاّت و رزگاری بوو. دواتر باوەڕی هێنا و لەسەر باوەڕەکەی پشت ئەستور بوو. کاتێك دەیویست سوێندێك بخوات، دەیوت: سوێند بەو کەسەی منی لەرۆژی بەدر رزگار کرد.

کاتێك قوڕەیشییەکان ئارامیان دەستکەوت، عەمرۆ کوڕی وەهبی جومەحیان ڕەوانە کرد تا ژمارە و ئەندازەی موسوڵمانەکان بەراوەرد بکات. ئەو ئەسپەکەی خۆی غاردا و گەڕایەوە و وتی: سێسەد پیاوی شەڕکەرن کەمێك زیاتر یا کەمتر. ئاڵاکانم بینی رەنگی مەرگیان پێوەیە. وشترەکانی ئەوان بەردەوام مەرگ رادەکێشن. پیاوە شەڕکەرەکانی ئەوان جگە لەشمشێرەکەیان پەنایەکی تریان نییە، سوێند بەخوا پیاوێك لەوان ناکوژرێت مەگەر ئەوەی پیاوێکی لەئێوە کوشتبێت. ئەگەر بەئەندازەی خۆیان لەئێوە بکوژن، کەواتە چ سودێك لەم ژیانە. ئێستا بڕوانن تا بزانن چی دەبینن. من ئەوەی پێویست دەکات بەئێوەم وت.

کاتێك حەکیم کوڕی حوزام ئەمەی بیست، رۆشتە ناو ئەو خەڵکە و گەشتە لای عوتەبە کوڕی رەبیعە و وتی: ئەی باوکی وەلید، تۆگەورە و سەروەری قورەیشی. ئایا دەتەوێك کارێك بکەیت تا کۆتایی رۆژگار بەباشە ناوی تۆ ببەن؟ وتی: چ کارێك؟ حەکیم کوڕی حوزام وتی: خەڵك بگەرێنەرەوە و خوێنبایی هاوپەیمانەکەت عەمرۆ کوڕی حەزرەمی بدە. عوتەبە کوڕی رەبیعە وتی: ئەو کارە دەکەم، خوێن و ئەوەی لەسامانەکەی بەفیڕۆ چووە، لەئەستۆی مندایە. ئێستا بڕۆ لای کوڕی حەنزەلیە(ئەبو جەهل) چوونکە لەو باشتر ناناسم خەڵك گومڕا بکات و لەخشتەیان بەرێت. عوتەبە لەناو خەڵکەکەدا وەستاو وتی: ئێوە لەرێگەی ڕووبەڕووبونەوە و شەڕ کردن لەگەڵ محەممەد بەهیچ کام لەمەبەستەکانتان ناگەن. سوێند بەخوا، ئەگەر بەسەر ئەواندا زاڵ بن بەردەوام لەناو ئێوەدا کەسانێك دەبن ناتوانن سەیری ڕوخساری کەسانیتر بکەن چوونکە دەبینن ئەم یا ئەو، کوڕە مام یا کوڕە پوری یەکێك لەپیاوانی بنەماڵەکەی کوشتووە. حەکیم کوڕی حوزام دەڵێت: دواتر رۆشتمە لای ئەبوجەهل و بینیم زرێیەکی دەرهێناوە و سەرقاڵی ئامادە کردنییەتی.

ئەوم لەوتاری عوتەبە ئاگادار کردەوە. وتی: سوێند بەخوا قورگی ئاوساوە و سنوری خۆی بەزاندووە ئەمە لەبەر ئەوەیە کە محەممەد و هاورێکانی بینیوە. سوێند بەخوا ناگەڕێینەوە تاخوا لەنێوان ئێمە و محەممەد داوەری بکات. عوتەبە لەوەی بینیویەتی ترسی نییە. ئەو بینیویەتی کوڕەکەی باوکی حوزەیفە لەناو یارانی پێغەمبەردایە و لەبەر ئەمە، ترساوە ( کە بەشمشێر لەناوی ببەن)

دواتر ئەبو جەهل کەسی بۆ لای عامر کوڕی حەزرەمی نارد و وتی: ئەم هاوپەیمانەی تۆ دەیەوێت خەڵك بۆ مەککە بگەڕێنێتەوە. تۆ ڕژانی خوێنی براکەت عەمرۆ کوڕی حەزەرمیت بەچاوی خۆت بینیوە، ئێستا بەدوای پارێزەر و پشتیوانی خۆت بگەڕێ و کوژرانی براکەت لەبیرمەکە. عامر هەستا و بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئای درێغ لەعەمرۆ! هاوار بۆ براکەم عەمرۆ! لەناکاو خەڵك شڵەژان وبۆ زیان گەیاندن بەیەك و کوشتاری یەك کەوتنە جۆش و خرۆش و ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند.

کاتێك وتەی ئەبوجەهل (ئەوەی وتبووی قورگی ئاوساوە) بەگوێی عوتەبە گەشت، وتی: ئەم پیاوە شەرواڵی زەرد کردووە (خۆی پیس کردووە) بەزوترین کات دەزانێت کێ قورگی ئاوساوە، من یا ئەو! دواتر داوای خودەی کرد بیکاتەسەری بەڵام چوونکە سەری گەورە بوو، خودەیەك بەو ئەندازەی نەدۆزییەوە. دواتر روخسار پۆشەکەی خۆی هاوشێوەی دەستاڕ لەسەر بەست و سوچێکی شۆڕ کردەوە.

لەم کاتەدا ئەسوەد کوڕی عەبدئەلئەسوەد مەخزومی کەپیاوێکی خراپەکار بوو، هاتەدەر و وتی: لەگەڵ خوا پەیمان دەبەستم یا لەناو بەستەکەی ئەوان ئاو دەخۆمەوە یاوێرانی دەکەم یا لەم ڕێگادا گیان لەدەست دەدەم. حەمزە ڕووبەڕووی بویەوە و بەشمشێر لەقاچیدا و نیوەی قاچی بەتەواوی قرتاند و کەوتە سەر زەوی. دواتر بەخزان بەرەو ئاوبەستەکە ڕۆشت و خۆی خستە ناوی تا سوێندەکەی بەجێ هێنابێت. حەمزە شوێنی کەوت و بەشمشێر لێیدا تا لەناو ئاوبەستەکە کوژرا.

دواتر عوتەبە کوڕی ڕەبیعە و شیبە کوڕی ڕەبیعە و وەلید کوڕی عوتەبە لەناو سوپای بتپەرستان هاتنەدەر و داوای شەڕکەریان کرد. لەم لاوە عەوف کوڕی عەفرا

و مەعوز کوڕی عەفرا و عەبدوڵلە کوڕی ڕەواحە، هەر سێکیان لەئەنسار هاتنەدەر و ڕووبەڕوویان بونەوە. ئەوان پرسیان: ئێوە کێن؟ وتیان: لەئەنسارین. بتپەرستەکان وتیان: ئێوە شەڕکەرێکی گەورەن بەڵام ئێمە پێویستمان بەئێوە نییە. دەبێت ئەو کەسانەی شەڕمان لەگەڵ دەکەن لە خەڵکەکەی خۆمان بن. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی حەمزە، ئەی عوبیدە کوڕی حارس، ئەی عەلی، هەستن. ئەم سیانە هەستان و بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان ڕووبەڕوویان بوونەوە. عوبیدە کوڕی حارس کەسەرکردەی شەڕکەران بوو، ڕووبەڕووی عوتەبە بویەوە، حەمزە لەگەڵ شیبە و عەلی لەگەڵ وەلید. حەمزە هیچ دەرفەتێکی بەشیبە نەدا و ئەوی کوشت. عەلیش دەرفەتی بە وەلید نەدا و گیان لێ سەند. بەڵام عوبەیدە لەگەڵ عوتەبە شەڕی کرد و هەرکام زەرەبەیەکی لەویتر دا و برینداری کرد . عەلی و حەمزە هێرشیان کردە سەر عوتەبە و لەتیان کرد و خستیانە سەر زەوی و عوبەیدە کوڕی حارسیان گەڕاندەوە کەقاچی قرتابوو. کاتێك ئەویان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) هێنا، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) خوا، ئایا من گیانباز نیم؟ وتی: هەیت. وتی: ئەگەر ئەبوتالیب ببوایە و منی بدیایە، دەیزانی من شیاوترم لەوتەکەی ئەو کەدەڵێت:

و نسلمة حتی نصرع حوله      و نذهل عن ابنائنا و الحلائل

واتاکەی: ڕێزی لێدەگرین تا گیانی بۆ ببەخشین و لەم ڕێگادا ژن و منداڵەکانمان لەبیر دەکەین.

دواتر مرد. خەڵك ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. ئەبو جەهل بەردەوام دەیوت، ئەوەی زیاتر پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووە و باسی ئەو شتانە دەکات کەئێمە نایزانین، ئەم بەرەبەیانە لەناوی بەرە. ئەو بو کە لەخوا دەپاڕایەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەیارانی خۆیدا بو هێرش نەکەن تائەو فەرمانیان پێ بدات. وتی: ئەگەر ئەم خەڵکە گەمارۆیاندان، ئەوان بەتیرباران کردن لەخۆتان دوەربکەنەوە. ڕۆشتە ناو سایەوانەکە و ئەبوبەکر لەگەڵیدابوو. پێغەمبەر(د.خ)

بەردەوام دەیوت: خواوەند ئەگەر ئەم دەستەیە لەئیسلام بۆ لەناوچوون ڕەوا بزانیت، هیچ کات ناپەرەستریێت. خوایە ئەوەی موژدەت بەمن داوە بهێنەدی و ئەنجامی بدە. بەردوام لەخوا دەپاڕایەوە تا عاباکەی کەوتە خوار. ئەبوبەکەر خستیەوە سەرشانی و وتی: پاڕانەوە و سوێندانی خواکەت بەسە. خوا مژدەکەی بۆ تۆ دەهێنێتەدی. پێغەمبەر(د.خ) لەسایەوانەکە حەوایەوە و کەمێك خەوت، دواتر هەستا و وتی: ئەی ئەبوبەکەر، هاوکاری خواکەت گەشت. ئەمە جبرەئیلە هەوساری ئەسپەکەی خۆی گرتووە و بۆ پیشەوە غاردەدات و لەسەر دانەکانی پێشەوەی تۆز نیشتووە. خوا ئەم ئایەی نارد: بیر بێننەوە ئەو کاتەی داوای یارمەتیتان لەخوا دەکرد و ئەو وەڵامی داوەکەی ئێوەی دایەوە و فەرمووی بە هەزار فریشتە یارمەتی ئێوە دەدەم کەبەردەوام بەدوای یەك دێن (انفال/٨/٩)

پێغەمبەر(د.خ) هاتەدەر و ئەم ئایەی خوێند: بەزوویی ئەم دەستەیە تێکدەشکێن و بەدوای دواین ڕێگەی هەڵاتنەوەن (قمر٥٤/٤٥). موسوڵمانانی بۆ شەڕ هاندا و وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، هیچ پیاوێك ئەمڕۆ بەخۆڕاگری و هێرش کردن ( بێ پاشەکشێ کردن) لەگەڵ ئەوان شەڕ ناکات مەگەر ئەوەی خواوەند یەکسەر بۆ ناو بەهەشتی بنێرێت. عومەیر کوڕی حومامی ئەنساری کەچەند دنکێ خورمای بەدەستەوە بوو و دەیخوارد، وتی: هێی، هێی! لەنێوام من وبەهەشت ئەو مەودایە کە ئەوان من بکوژن ویەکڕاست بۆ بەهەشت بڕۆم. دواتر خورماکانی فڕێدا و بەشێوەیەك شەڕی کرد کەلەسەر دەستی ئەوان کوژرا. تیرێکیان بۆ مێهجەع کۆیلەی عومەری کوڕی خەتاب هاویشت و کوشتیان. ئەو یەکەم کوژراو بوو. دواتر تیرێك بەر حارسە کوڕی سوراقەی ئەنساری کەوت و دەستبەجێ کوژرا. عەوف کوڕی عەفرێ شەڕی کرد تا گیانی لەدەستدا. پیاوان لەهەردولاوە دەستیان بەشەڕ کرد. دواتر پێغەمبەر(د.خ) مشتێك خۆڵی هەڵگرت و بەسەر قوڕەیشییەکانی پرژاند و وتی: ئەم ڕوخسارانە قێزەون بن. بەهاوەڵانی وت: هێرشیان بکەنە سەر. شکەست کەوتە ناو سوپای بتپەرستان و خوا دەستەیەك لەوانی کوشت و دەستەیەك ئەسیر کران.

پێغەمبەر(د.خ) لەسایەوانەکەیدا بوو و سەعد کوڕی مەعاز هاوڕێ لەگەڵ

دەستەیەك لەئەنسار بەشمشێری دەرکێشراو پارێزگاریان لێدەکرد چوونکە دەترسان دوژمنان هێرشی بکەنەسەر. پێغەمبەر(د.خ) لەروخساری سەعد کوڕی مەعاز نارەزامەندی بینی کەبتپەرستەکان بەئەسیری دەگرن. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: ئەی سەعد، دەڵێی ئەم کارە پەسەند ناکەیت. وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. یەکەم ڕووبەڕووبونەوەمانە لەگەڵ بتپەرستان کوشتن و لەخوێن گەوزاندنی ئەوان لای من پەسندترە لەوەی پیاوانیان بەزیندوویی بهێڵینەوە.

یەکەم کەس ڕووبەڕووی ئەبو جەهل بویەوە، مەعاز کوڕی عەمرۆ کوڕی جەموح بوو. ئەو بینی قورەیشییەکان دەوری ئەبوجەهلیان گرتووە و پارێزگاری لێدەکەن و دەڵێن: کەس ناتوانێت دەستی بەباوکی حەکەم بگات. مەعاز دەڵێت: من ئەم کارەم لەسەر خۆم پێویست کرد. کاتێك دەستم بەو گەشت، بەشمشێر هێرشم کردە سەر و بەشێوەیەك لێمدا کەقاچی قرتا. کورەکەی عێکرەمە شمشێرێکی لەدەستی مندا و دەستمی لەسەروی بازومەوە قرتاند. دەستم بەپێستەکەیەوە لەشانمەوە هەڵواسرا. سەراسەری ئەو ڕۆژە شەڕم کرد و دەستە بڕاوەکەم بەدوای خۆمدا رادەکێشا. کاتێك ئازارەکەی زیادی کرد، خسمە ژێر قاچی خۆم و بەزۆر رامکێشا و لەسەر زەوی فڕمدا.

مەعاز تا ڕۆژگاری عوسمان زیندوو مایەوە.

دواتر مەعوز کوڕی عەفرا لای ئەبوجەهل تێپەڕی، لێیدا و زەوی گیری کرد. بەنیوەگیانی بەجێی هێشت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووبووی لەناو کوژراوەکاندا بۆی بگەڕێن. عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود ڕۆشتە سەری و بینی دوایین هەناسەکان دەکێشێت. دەڵێت: قاچم خستە سەر ملی و وتم: ئەی دوژمنی خوا، ئایا بینیت کەخوا تۆی ڕیسوا کرد؟ وتی: بۆ ڕیسوای کردووم؟ گەورەترین پیاو بوم کەئێوە کوشتان. ئێستا پێم بڵێ شەڕ لەبەرژەوەندی کێ تەواو بوو؟ وتم: لەبەرژەوەندی خوا و نێردراوەکەی. ئەبوجەهل پێی وت: ئەی شوانی مەڕ، هاتوویتە شوێنێکی سەخت. وتم: بێ گومان دەتکوژم. وتی: تۆ یەکەم کۆیلە نیت کە سەروەری خۆی دەکوژێت. ناخۆشترین شت بۆ من ئەمرۆ ئەوەیە کەتۆ من دەکوژیت نەیەکێك لەهاوپەیمانە خۆش بۆنەکان. عەبدوڵڵە بەشمشێر لەملیدا بەشێوەیەك سەری کەوتە

بەرپێی. هەڵیگرت و هێنای بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) سەری لەسەر زەوی دانا و سوپاسی خوای کرد.

عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف چەند زرێیەکی بەتالانی هەڵگرت و لەم کاتەدا لای ئومەییە کوڕی خەلف و کوڕەکەی عەلی کوڕی ئومەییە تێپەڕی کرد. ئەو دووانە پێیان وت: ئێمە بەئەسیری بگرە کەلەو زرێیانە بۆ تۆ باشترین (تا نەکوژرێین). ئەو زرێکانی فرێدا دەستی ئەو و کوڕەکەی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. ئومەییە وتی: ئەو پیاوەی پەڕی وشترمڵی لەسەر سینەی هەڵواسیوە، کێیە؟ وتی: حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب. وتی: ئەو بو ئەم بەدبەختیانەی بەسەر ئێمەدا هێنا.

لەم کاتەدا بیلال چاوی بەئومەییە کەوت. ئومەییە لەسەرەتایی ئیسلام لەمەککە ئەوی ئەشکەنجە دەدا. ئەوی دەبرد زەوییەکی گەرم و لەسەر پشت دەیخواند و فەرمانیدەدا و تاشەبەردێکی گەورەیان دەهێنا و دەیانخستە سەر سکی. بەوی دەوت: بەردەوام بەم شێوە دەبیت تا واز لەئایینەکەی محەممەد دێنیت. بیلال بەردەوام دەیوت: تاقانەیە، تاقانەیە. کاتێك بیلال بینی، هاواری کرد: ئەمە ئومەییەیە! سەرکردەی بتپەرستان! رزگارم نەبێت ئەگەر رێگە بدەم رزگارت بێت. دواتر بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی یارانی خوا! ئەمەیە سەرکردەی ناباوەڕان ئومەییە کوڕی خەلەف! رزگارم نەبێت ئەگەر رێگە بدەم رزگاری بێت. موسوڵمانەکان دەوریان گرت و ئومەییە کوڕی خەلەف و کوڕەکەیان کوشت. عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف بەردەوام دەیوت: خوا لەبیلال خۆش بێت. زرێ کانم لەدەست چوو و ئەو ئەسیرەکانی لەدەستم دەرهێنا. هەروەها حەنزەلە کوڕی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب کوژرا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی کوشت.

کاتێك بتپەرستەکان شکستیان خوارد، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا ئەبوبەختەری کوڕی هوشام نەکوژرێت چوونکە ئەو لەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە بوو، زیاتر لەهەمووان ئازاری بتپەرستەکانی لەو دووردەخستەوە. هەروەها یەکێك بوو لەو کەسانەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو رێکەوتننامەیە (کە بۆ زیانگەیاندن بەپێغەمبەر(د.خ) نوسراوبوو) هەوڵی دەدا. موجەزەر کوڕی زیاد بەلەوی هاوپەیمانی ئەنسار ئەوی بینی لەگەڵ هاورێکەی خۆیەتی. پێی وت:

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیداوە تۆ نەکوژین. ئەبوبەختەری وتی: هەروەها هاورێکەم؟ وتی: نە، سوێند بەخوا. ئەبوبەختەرەی وتی: ئەگەر وابێت سوێند بەخوا من و ئەو پێکەوە دەمرین تا نەکا ژنانی قورەیش بڵێن، من لەبەر حەزم بۆ ژیان، دەستم لەهاورێکەم بەردا. مەجزەر ئەوی کوشت و هەواڵی ئەم کارە بەپێغەمبەر(د.خ) گەشت.

لەم کاتەدا عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەریان هێنا کە باوکی یەسر ئەسیری کردبوو. ئەویان بەزنجیر بەستبوو (باوکی یەسر پیاوێکی لاواز و کەمگۆشت بوو) و عەباس پیاوێکی قەڵەو. بەباوکی یەسریان وت: چۆن ئەوت گرفتار کرد؟ وتی: پیاوێك لەم کارەدا هاوکاری کردم کەهیچ کات نەمبینیبوو. ئەو پەیکەر و روخساری بەمشێوە بوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فریشتەیەکی رێزدار هاوکاری تۆی کردووە. کاتێك عەباس بەئەسیری رۆژی کردە شەو، پێغەمبەر(د.خ) لەسەرەتایی شەوەوە بێ خەوی گرتییەوە. یارانی پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا، چیت لێهاتووە کەخەو و ئارامیت نییە؟ وتی: بینیم عەباس لەزنجیردایە و لەتاو ئازار لەخۆی دەئاڵێت و دەناڵێت، خەو لەسەرم پەڕی. ئەوان ڕۆشتنە لای عەباس و کردیانەوە و پێغەمبەر(د.خ) خەوی لێکەوت.

پێغەمبەر(د.خ) لەورۆژەدا بەیارانی خۆی وت: پیاوانێك لەمناڵەکانی هاشم و کەسانیترم بینی کە لەورۆژەدا بەزۆر بۆ ئەم شەڕە هێنراون. هەرکام لەئێوە کەسێك لەمناڵەکانی هاشمی بینی، نەیکوژێت: هەر کەس عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی بینی، نەیکوژێت کەبە زۆر بۆ ئەم شەڕە هێنراوە. باوکی حوزەیفە کوڕی رەبیعە کوڕی عوتەبە وتی: ئایا کوڕان و باوکان و براکانی خۆمان بکوژین و عەباس نە؟ سوێند بەخوا ئەگەر ببینم بەخراپترین شێوە بەم شمشێرە دەیکوژم. ئەم وتە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەشت. ئەو بەعومەری وت: ئەی باوکی حەفس، ئایا وتەی باوکی حوزەیفە نابیستیت؟ ئایا شمشێر لە مامی پێغەمبەر(د.خ) خوا دەکێشن؟ باوکی حوزەیفە وتی: بەردەوام لەو قسەی کردم، دەترسام کەجگە لەگیاندان لەرێگەی خوا، کارێك نییە ئەو گوناحە لەمن بسرێتەوە. ئەو لەرۆژی یەمامە (لەشەڕی یەمامە) گیانی بەخشی. پێغەمبەر(د.خ) وتبووی: لەرۆژی شەڕی بەدر

جبرەئیلم بینی، تۆز لەسەر ددانەکانی پێشەوەی نیشتبوو.

پیاوێك لەمناڵەکانی غەفار دەڵێت: من و کوڕە مامەکەم لەوڕۆژە ڕوومانکردە کوێستانێك تا لەسەرەوە لەگۆڕپانی شەڕی بەدر بڕوانین. لەو کاتەدا بتپەرەست بووین و دەمانویست بزانین کێ سەردەکەوێت. پەڵە هەورێك لەئێمە نزیك بوویەوە و من لەناویەوە گوێم لەدەنگی حیلەی ئەسپەکان و دەنگێ بیژەرێك بوو کەدەیوت: بەرەو پیش ئەی حیزۆم! دەڵێت: بەڵام کوڕە مامەکەم، لەترسا دەستبەجێ گیانیدا.

باوکی داوودی مازنی دەڵێت: شوێن پیاوێك لەبتپەرستەکان کەتبووم تا بەشمشێر بیکوژم کە لەناکاو بینیم پێش ئەوەی بیکوژم، سەری لەپێش قاچمدا کەوتووە. زانیم کەسێك جگە لەمن ئەوی کوشتووە. سەهل کوڕی حەنیف دەڵێت: بەوشێوە بوو کەهەندێك لەئێمە شمشێری بۆ بتپەرەستێك دەکێشا بەڵام پێش ئەوەی شمشێرەکەی بەرکەوێت، سەری لەلاشە جیادەبویەوە و دەکەوتە سەر زەوی.

کاتێك خوا بتپەرستەکانی تێکشکاند و دەستەیەکی کوشت و دەستەیەکی ئەسیر، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا تا کوژراوەکان بخەنە ناو چاڵێکی کۆنی وێران. کوژراوی بتپەرەستەکانیان خستە ئەو چاڵەوە بەڵام ئومەییە کوڕی خەلەف ئاوسابوو و زرێکەی بۆ جەستەی تەنگ. ڕۆشتن تا پەیکەرەکەی دەربێنن کەلەت لەت بوو. ئەویان لەوێدا بەجێهێشت و بەخاك وبەرد دایانپۆشی. کاتێك ئەوانیان خستە ناوچاڵەکەوە، پێغەمبەر(د.خ) لەسەر سەریان وەستا و وتی: ئەی خەوتووانی ناو چاڵەکە، چ خزمانێکی خراپ بوون بۆ پێغەمبەرەکەتان! ئێوە منتان بەدرۆزن و خەڵکان قسەی منیان بەراست زانی. دواتر وتی: ئەی عوتەبە، شیبە، ئومەییە کوڕی خەلەف، ئەبوجەهل کوڕی هوشام (و هەموو خەوتووانی ناو چاڵەکە)ئایا موژدەی ڕاستی خواییتان بینی؟ من ئەوەی خوا موژدەی پێدابووم، بینیم. یارانی وتیان: ئایا لەگەڵ مردووەکان قسە دەکەیت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئێوە لەبەرابەر ئەو قسانەی دەیکەم لەوان بیسەرتر نین بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵامی من بدەنەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ مردووەکانی ناو چاڵەکە قسەی دەکرد، لەروخساری باوکی حوزەیفە نارەزامەندی بینی. ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا بوو پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: دەڵێی سەبارەت بەچارەنوسی باوکت سەرگەردانی؟ باوکیحوزەیفە وتی: نە

بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ کات سەبارەت بە باوکم گومانم نەبووە چوونکە بتپەرەست بوو، بەکوژرانی رازیبووم بەڵام ئەوم بەبیرمەند و فرەزانێکی گەورە بینی و هیواداربووم باوەڕ بەئیسلام بێنێت و کاتێك بینیم لەسەر بتپەرەستی مرد، خەمبار بووم. پێغەمبەر(د.خ) لەخوا بۆ ئەو پاڕایەوە.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا ئەوەی لەگۆڕەپانی شەڕدایە کۆبکەنەوە. کۆیان کردەوە و لەسەر دابەشکردنی شەڕیان کرد. ئەوانەی کەکۆیان کردبویەوە، وتیان: هی ئێمەیە. ئەوانەی کەشەڕیان کردبوو، وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر ئێمە نەدەبوین ئەم تالانییەتان دەست نەدەکەوت. ئێمە دوژمنمان سەرقاڵ کرد تائێوە بتوانن ئەمانە کۆبکەنەوە. ئەوان لەسایەوانەکە پارێزگاریان لە پێغەمبەر(د.خ) دەکرد وتیان: سوێند بەخوا ئێوە لەئێمە شیاوتر نین. ئەو کاتەی کەس پارێزگاری لەکالاکان نەدەکرد، دەمانتوانی هەڵیانگرین و بینیمان بردنی بۆ ئێمە ئاسانە بەڵام ترساین دوژمنان جارێکیتر هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر(د.خ) و لەبەر ئەمە لەسەر ئەرکەکەمان ماینەوە. لەم کاتەدا بو خوا ئەنفالی لەدەست شەڕکەران و کەسانیتر دەرهێنا و تایبەت بەپێغەمبەری کرد و ئەویش بەشێوەیەکی یەکسان لەناو خەڵکدا دابەشی کرد.

پێغەمبەر(د.خ)، عەبدوڵڵە کوڕی ڕەواحەی وەك موژدەدەر بۆ خەڵکی سەرەوەی مەدینە نارد و زەید کوڕی حارسەی بۆ لای خەڵکی خوارەوەی مەدینە. زەید کاتێك گەشتە مەدینە، خەڵك ئارامگای روقیە کچی پێغەمبەریان تەخت کردبوو. ئەو هاوسەری عوسمان کوڕی عەففان بوو کە پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەمەدینە لای ئەو خاتوونە دانابوو.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە، خەڵك پێشوازیان لێکرد و بۆ ئەو سەرکەوتنە پیرۆزباییان لێکرد. سەلەمە کوڕی سەلامە کوڕی وەقشی ئەنساری وتی: چاومان بەپیرە بێ موەکان هاوشێوەی وشتری دەست وپێ بەستراو کەوت و هەموویانمان سەربری. پێغەمبەر(د.خ) بزەیەکی گرت و وتی: کوڕی براکەم، ئەوان سەرکردەکانی قورەیش بون.

نەزر کوڕی حارس و عوقبە کوڕی باوکی موعەیەت لەناو ئەسیرەکان دەبینران.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەعەلیدا بیکوژێت و عەلی ئەوی لە سەفرۆ سەربڕی. ئەو بەعاسم کوڕی سابت فەرمانیدا عوقەبە کوڕی باوکی موعەیەت بکوژێت. کاتێك ویستیان بیکوژن دەستی بەشین و گریان کرد و وتی: بۆ من لەگەڵ ئەم ئەسیرانە بەبەرابەر دانانێن؟ ئەوسا وتی: ئەی محەممەد چی بەسەر منداڵە بێ سەرەپەرستەکانم دێت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئاگری جەهەننەم. عاسم کوڕی سابت لەشوێنێك بەناوی (عرق الظبیە) بەئەشکەنجەوە کوشتی.

سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەناو ئەسیرەکان دەبینرا کەمالك کوڕی دوخشۆمی ئەنساری ئەسیری کرد. کاتێك هێنایان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)، عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، فەرمان بدە تا دوو ددانی پێشەوەی دەربێنم تا ئیتر هیچ کات لەدژی تۆ قسە نەکات. لێوی خوارەوەی سوهەیل قەڵشابوو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی عومەر وازی لێبێنە کەبەزوترین کات پێگەیەك هەڵدەبژێرێت کە تۆ وەسفی دەکەیت. پێگەکەی ئەوە بوو کە لەکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) و هەڵگەڕانەوەی عەرەبەکان لەئایینی ئیسلام، هەڵیبژارد و بەخواستی خوا ئێمە لەداستانی هەڵگەڕاوەکان ئاماژەی پێ دەدەین. کاتێك سوهەیل بەمەدینە گەشت، سودە کچی زەمەعە هاوسەری پێغەمبەری(د.خ) پێی وت: ئایا هاوشێوەی ژنان خۆت بەدەست وپێ بەستراو تەسلیمی ئەوان کرد؟ بۆ وەك گەورەکان نەمردی؟ پێغەمبەر(د.خ) ئەم قسەی بیست و وتی: ئەی سودە، ئایا خەڵك دژی خوا و پێغەمبەر(د.خ) هەڵدەخرێنیت؟ سودە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر شتێکم وت، لەبەر ئەوە بوو کاتێك ئەوم بینیم، نەمتوانی خۆراگری بکەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پێشنیاری چاکەکاری لەگەڵ ئەسیرەکان بەیەك بکەن. وای لێهات هەندێك خواردنیان نەدەخوارد و دەیاندا بەئەسیرەکانی خۆیان.

یەکەم کەس گەشتە مەککە و هەواڵی تێکشکانی قوڕەیشییەکانی هێنا، حەیسومان کوڕی عەبدوڵڵە خوزاعی بوو. پێیان وت: چ هەواڵێکت پێیە؟ وتی: عوتەبە، شیبە، ئەبو حەکەم، مونبە کوڕی حەجاج و کەسانیتر کوژران. سەفوان کوڕی ئومەییە وتی: سوێند بەخوا عەقڵی لەدەستداوە. سەبارەت بەمن لەو بپرسن. وتیان: سەفوان چۆنە.؟ وتی: ئەوەی لەحوجر دانیشتووە، خۆم بینیم باوك و

براکەی کوژران.

ئەبو لەهەب نۆ ڕۆژ دوای گەشتنی هەواڵی کوژرانی قوڕەیشییەکان بەمەککە مرد. دواتر قوڕەیشییەکان پرسە و شینگێڕانیان دەست پێکرد. وتیان: پرسە مەگێڕن، چوونکە محەممەد و هاوەڵانی سەرزەنشتتان دەکەن. هەروەها بۆ کڕینەوە ئەسیرەکانتان هیچ کارێك مەکەن تا محەممەد ستەمتان لێنەکات. ئەسوەد کوڕی عەبد یەغوس داخی سێ کوڕی خۆی بینیبوو: زەمەعە، عەقیل، حارس. ئەو حەزی دەکرد بۆ کوڕەکانی بگریت. ڕۆژێك دەنگی گریانی بیست. ئەو کەڕووناکی چاوی لەدەست دابوو، بەکۆیلەکەی وت: بزانە ئایا گریانینان ڕەوا کردووە تا بۆ زەمەعە بگریم چوونکە دڵم لەناوەوە دەسوتێت و ئاگر لەناخمەوە دێتەدەر. ئەسوەد وتی:

| | |
|---|---|
| اتبکی ان یضل لها بعیر | و یمنعها من النوم السهود |
| ولا تبکی علی بکر و لکن | علی بدر تقاصرت الجدود |
| علی بدر سراة بنی هصیص | و مخزوم ورهط ابي الولید |
| و بکی ان بکیت علی عقیل | و بکی حارثا اسد الاسود |
| و بکیهم ولا تسمی جمیعا | فما لا بی حکیمة من ندید |
| الا قد ساد بعدهم اناس | ولو لا یوم بدر لم یسودوا |

واتاکەی: ئایا ئەو ژنە دەتوانێت بگرییت کەوشترەکەی ون کردووە؟ ئایا بێدار خەوێك ڕێگەی حەوانەوەی لێ دەگرێت؟ بۆ بەکر مەگری بەڵکو بۆ بەدر کە ئێمە لەوێ شانسمان لەدەستدا. لەبەدر کەگەورەکانی مناڵەکانی هەسیس و مەخزم و دەستەکەی باوکی ئەلوەلید لەخاك و خوێندا گەوزان. ئەگەر دەتەوێت بگری، بۆ عەقیل بگری، بۆ حارس کەشێری شێران بوو. بۆ هەموویان بگری و شین بکە. ئاگاداربە بێزار نەبیت چوونکە کوڕەکەم باوکی حەکیمە وێنەی نییە. دوای ئەوە کەسانێك بەسەروەری گەشتن کەئەگەر شەڕی بەدر نەبوایە هیچ کات دەستیان بەگەورەیی نەدەگەشت.

مەبەستی لەم تازە گەورانە، ئەبو سوفیانی و کەسەکانی دیکە بوو.

دواتر قورەیشییەکان بۆ کڕینەوەی ئەسیرەکانی خۆیان هەوڵیاندا. یەکەم کەس ئازادییەکەی کڕیایەوە، باوکی وەداعە سەهمی بوو. کوڕی موتەلیب ئەوی کڕییەوە. عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب بەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) خۆی کڕییەوە و هەروەها ئەمانە: عەقیل کوڕی ئەبی تالب، حارس کوڕی عەبدولموتەلیب و هاوپەیمانەکەی عوتەبە کوڕی عەمرۆ کوڕی جەحدەم. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی خۆکڕینەوەی خۆی و ئەمانەی پێدا، وتی: سامانی تەواوم بۆ ئەم کارە نییە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەو زێرانە چی لێهات دات بە دایکی فەزل و وتت: ئەگەر کوژرام، ئەوەندەی بۆ فەزڵ بێت وئەوەندەی بۆ عەبدوڵڵە وئەوەندەی بۆ عوبیەدالله؟ عەباس وتی: سوێند بەو کەسەی بەراستی و دروستی تۆی ناردووە جگە لەمن و هاوسەرەکەم کەس ئاگاداری ئەو زێرانە نەبووە. من بێ گومان دەزانم تۆ نێردراوی خوایت. ئەو خۆی و دو کوڕی براکەی و هاوپەیمانەکەی کڕییەوە. لەگەڵ عەباس بیست (وەقیە) ٤٠ تا ٦٦ درەم دۆزرایەوە. ئەو بە پێغەمبەری وت: ئەم زێرە لەبەهای خۆکڕینەوەی ئێمە کەم بکەرەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نایکەم ئەمە شتێکە خوای گەورە بەئێمەی بەخشیوە.

عەمرۆ کوڕی ئەبو سوفیان لەناو ئەسیرەکان بوو کەلەسەر دەستی عەلی ئەسیر کرا. بەباوکیان وت: کوڕەکەت بکڕەوە. وتی: دووبەدبەختی بەسەر خۆم ناهێنم. کوڕێکیان کوشتم و ئەمیان گرتووە و سامانەکەمیان دەوێت. خوێنی حەفزەڵە بەفیڕۆچوو و ئێستا بەهای ئازدای عەمرۆیان دەوێت! ئەوی نەکڕییەوە. دواتر سەعد کوڕی نەعمانی ئەنساری بۆ عەمرە کردن ڕۆشتە مەککە و ئەبوسوفیان گرتی. قورەیشییەکان کاریان بەوکەسانە نەبوو کەدەهاتن بۆ حەج و عەمرە. ئەبوسوفیان ئەوی زیندانی کرد تا لەبەرابەر ئازاد کردنی کوڕەکەی ئازادی بکات. ئەو وتی:

ارهط بن اكال اجيبوا دعاعه تعاقدتم لا تسلموا السيد الكهلا

فان بني عمرو لئام اذله لئن لم يفكوا عن اسيرهم الكبلا

واتاکەی: ئەی منداڵەکانی پیاوی زۆرخۆر، بانگەوازەکەی ئەو وەلاّم بدەنەوە چوونکە پەیمانتان بەستووە گەورە بەتەمەنەکەی خۆتان بەدوژمن مەسپێرن. هەمان کوڕی عەمرۆ پەست و لاواز بن ئەگەر بەند و زنجیر لەئەسیرەکەی خۆیان نەکەنەوە.

لەم کاتەدا منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) وداوایان لێکرد عەمرۆ کوڕی ئەبو سوفیان لەبەرابەر سەعد کوڕی نەعمان ئازاد بکات و ئەو ئەم کارەی کرد.

هەروەها باوکی عاس کوڕی ڕەبیع کوڕی عەبدولعزی کوڕی عەبدشەمس هاوسەری زێنەب کچی پێغەمبەری خوا بوو. ئەو لەهەموو پیاوانی مەککە زێری زیاتر وبەبازرگانێکی راستکردار هەژمار دەکرا. دایکی هالە کچی خوەیلد خوشکی خەدیجە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) بوو. ئەم ژنە داوای لەپێغەمبەر(د.خ) کرد کچەکەی بکاتە خێزانی کوڕەکەی و پێغەمبەر(د.خ) پێش گەشتنی وەحی ئەو کارەی کرد. کاتێك وەحی بەپێغەمبەر(د.خ) گەشت، زێنەب ئیسلامی هێنا و باوەڕی پێی کرد. پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە گرفتاری بتپەرستان بوو و لەبەر ئەمە نەیتوانی ئەم ژن و پیاوە لەیەك جیا بکاتەوە.

کاتێك قورەیشییەکان بۆ شەڕی بەدر ڕۆشتنەدەر، هاوسەرەکەی باوکی عاس کوڕی ڕەبیع ڕۆشت وئەسیر کرا. کاتێك قورەیشییەکان سەرقاڵی ئازاد کردنی ئەسیرەکانی خۆیان بوون، زێنەب بۆ ئازادکردنی هاوسەرەکەی باوکی عاس هەوڵی دەدا و ئەو گەردنبەندەی خەدیجە لەشەوی بوکێنیدا پێی دابوو، ناردی و داوای ئازادیی هاوسەرەکەی خۆی کرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەرندبەندەکەی بینی، گریا و وتی: ئایا دەکرێت ئەسیرەکەی ئەو ئازاد بکەن و گەردنبەندەکەی بۆ بگەرێننەوە؟ ئەوان ئەسیرەکەیان ئازاد کرد و گەردنبەندەکەیان بۆ گەڕاندەوە.

پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی لیٚ وەرگرت کەزێنەب بۆ مەدینە بنێرێت. باوکی عاس بۆ مەککە ڕۆشت و پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسە کۆیلەکەی خۆی وپیاوێك لەئەنساری نارد تا لەگەڵ زێنەب بۆ مەدینە بێن. کاتێك باوکی عاس گەشتە مەککە، بەزێنەبی وت بڕۆ بۆ لای باوکت. زێنەب بەنهێنی ساز وبەرگی هەڵگرت و خۆی ئامادە کرد. کەنانە کوڕی ڕەبیع برای باوکی عاس ئەوی سوار وشترەکەی خۆی کرد و کەوانەکەی هەڵگرت وئەوی لەڕۆژدا هێنایەدەر. قورەیشییەکان ئەمەیان بیست و شوێنی کەوتن ولە (زی طواء) پێی گەشتن. زێنەب دووگیان بوو و کاتێك

گەڕێنرایەوە، لەترسا منالەکەی لەبارچوو. کەنانە تیرەکانی خۆی ئامادە کرد و وتی: سوێند بەخوا کەس لەمن نزیك نابێتەوە مەگەر ئەوەی تیرێك لەجەرگی بدەم! ئەبو سوفیان کوڕی حەرب هاتە لای وتی: بەئاشکرا ئەوت بردەدەر و خەڵك گومانیان دەکرد ئەمە لەلاوازی ئێمەیە. سوێند بەگیانی خۆم پێویستمان بەزیندانی کردنی ئەو نییە. لەگەڵ ئەو ژنەدا بگەڕێرەوە و ئەوە بۆ ئێمە بەسە خەڵکان بڵێن ئێمە ئەومان گەڕاندۆتەوە. دواتر کەنانە بەشەودا ئەوی بردەدەر و تەسلیمی زەید کوڕی حارس و هاوڕێکەی کرد. ئەو دوانە زێنەبیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و زێنەب لای ئەو مایەوە. ماوەیەك دوای گرتنەوەی شاری مەککە، باوکی عاس بۆ بازرگانی بەسامانی خۆی و سامانی چەندین پیاو لەقوریشیەکان بەرەو شام بەرێکەوت. کاتێك ویستی بگەڕێتەوە، ژمارەیەك لەشەڕکەرانی ئیسلام ئەویان بینی و هەموو سامانەکەیان گرت و ئەو خۆی هەڵات. کاتێك شەو داهات خۆی گەیاندە مەدینە و ڕۆشتە لای زێنەب. بەرەبەیان پێغەمبەر(د.خ) لەماڵ هاتەدەر و ویستی بڕوات نوێژ بخوێنێت. ئەو بانگیدا کە(خوا گەورەیە) و خەڵکان هەموو وتیان (خوا گەورەیە) (ڕەنگە لەبەر ئەوە بوبێت کەتالآنی تازەیان دەست کەوتبوو). زێنەب لەشوێنی ژنانەوە هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، ئاگاداربن کە من پەنام بە باوکی عاس داوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەست ئەودایە، لەم کارە ئاگادار نەبوم، بەڵام هەموو موسوڵمانەکان دەتوانن پەنای خەڵکان بدەن. ئەو بەزێنەبی وت: نەکات باوکی عاس بێتە لای تۆ ( و لەئامێزی تۆدا بخەوێت) کەئەمە بۆ تۆ ڕەوا نییە. پێغەمبەر(د.خ) بەو شەڕکەرانەی تالآنییەکەیان بەدەست هێنابوو، وتی: ئەگەر بتانەوێت ئەتوانن سامانەکەی بۆ بگەڕێننەوە چوونکە ئێمە ئەومان خۆش دەوێت و ئەگەر نەتانەوێت، تالآنی خواییە کەخوا بەئێوەی بەخشیوە و ئێوە شیاون بۆی. وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) خوا، هەمووی دەگەڕێنینەوە. ئەوان سامانەکەیان بۆ گەڕاندەوە تەنانەت ئەو چیلکە و چەوێڵانەی بارەکانی پێ دەبست، گەڕاندیانەوە. ئەو بۆ مەککە گەڕایەوە و سامانەی خەڵکەکەی تەسلیم کردەوە و وتی: ئێستا شایەتی دەدەم کەخوا یەکەو محەمەد نێردراوی ئەوە. سوێند بەخوا تەنیا هۆکارێك ڕێگر بوو لەوەی باوەڕ بەئیسلام بێنم ئەوە بو گومان بەرن،

دەمویست سامانەکەی ئێوە بخۆم. دواتر لەمەککە هاتەدەر و ڕووی لەمەدینە کرد و ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەو هاوسەرەکەی لەسەر هەمان مارەی پێشوو بۆ گەڕاندەوە. دەستەیەك دەڵێن: پەیوەندیەکی تازەی لەگەڵدا بەست.

ڕۆژێك عومەیەر کوڕی وەهبی جومەحی لەگەڵ سەفوان کوڕی ئومەییە دانیشتن و گفتوگۆیان لەسەر شەڕی بەدر کرد. ئەو یەکێك لەو شەیتانانە بو کەپێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی زور ئازاردەدا. کوڕی وەهب لەناو دیلەکاندا بوو. سەفوان وتی: دوای کوژراوانی بەدر جیهان لەشادی و خۆشی بێ بەشە. عومەیر وتی: ڕاست دەکەیت، ئەگەر قەرزار و سەرپەرەستی بنەماڵەکەم نەبومایە، سوار لەسەر ئەسپ بەرەو محەممەد غارم دەدا و دەمکوشت. سەفوان وتی: قەرزەکەت بخە ئەستۆی من و خەرجی بنەماڵەکەیشت من دەیدەم وەك ژن و منداڵەکانی خۆم دەیانپارێزم. ئەو بەرەو مەدینە بەرێکەوت و ڕۆشتە ئەوێ. پێغەمبەر(د.خ) بەعومەر کوڕی خەتابی وت ئەو بۆ لای ببات. عومەر شمشێرەکەی لێ سەند و بە چەندین پیاو لەئەنساری کەلەگەڵ ئەودا بوون، وتی: بیبەن بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و ئاگاتان لەم ناپاکە بێت. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بینی، بە عومەری وت: ئازادی کە. دواتر وتی: ئەی عومەیر، وەرە پێش، بۆچی هاتوویت؟ وتی: بۆ ئەم دیلە. وتی: ڕاستی بەمن بڵێ. وتی: جگە لەمە بۆ هیچ کارێکیتر نەهاتووم. وتی: نا، وانییە، تۆ لەگەڵ سەفوان دانیشتی و ئەم گفتوگۆیانەتان کرد. عومەیر وتی: شایەتی دەدەم کەتۆ نێردراوی خوایت. ئەم گفتوگۆیە تەنیا لەنێوان من و سەفواندا بوو و کەس لێی ئاگادار نەبوو. سوپاس بۆ خوا کەمنی بۆ ئیسلام ڕێنوێنی کرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فێرکارییە دینییەکان و قورئان فێری ئەم براتان بکەن و ئەسیرەکەی ئازاد بکەن.. ئەو کارەیان کرد. عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من زۆر ئازاری موسوڵمانەکانم داوە، ئێستا داوات لێدەکەم فەرمان بدە بۆ مەککە بڕۆم و بانگەشەی خواپەرستی بکەم و ئازاری بتپەرستان بدەم بەهەمان شێوە کەهاوڕێیانی تۆم ئازار دەدا. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدا. سەفوان بەردەوام دەیوت: ئێستا نیگەرانی ڕووداوێك بن کەبیرەوەری شەڕی بەدر لەمێشکی ئێوە بسڕێتەوە.

کاتێك عومەیر گەشتە مەککە، لەوێ مایەوە و خەڵکانێکی زۆر لای ئەو باوەڕیان

بەئیسلام هێنا. ئەو زۆر ئازاری بتپەرستانی دەدا.

دوبارە مێکرەز کوڕی حەفس کوڕی ئەخیف بۆ کڕینەوەی سوهەیل کوڕی عەمرۆ دەرکەتەوە. پێغەمبەر(د.خ) خوا لەم کاتەدا لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر و عەلی سەبارەت بەدیلەکان بۆ راوێژ کردن کۆببویەوە. ئەبوبەکر پێی وابوو کە بیانفرۆشنەوە و عومەریش دەیوت بیانکوژن. پێغەمبەر(د.خ) فرۆشتنی لەکوشتن پێ باشتر بوو و خوا ئەم ئایەیی نارد: شیاو نییە بۆ هیچ پێغەمبەریك ئەسیری هەبێت مەگەر دوای ئەوەی خوێنی زۆر لەسەر زەوی رژابێت. ئێوە کالآی ئەم دنیاتان دەوێت و خوا ئەو دنیایی بۆ ئێوە دەوێت و خوا راست کردار و فرەزانە. ئەگەر پێشتر نوسراوێك لەلایەن خواوە نەهاتبایە، ئێوە لەبەرابەر ئەوەی وەرتان دەگرت، ئازارێکی زۆرتان پێدەبڕا (ئەنفال / ٨ ٦٧—٦٨) ( دوای شەڕی بەدر موسوڵمانەکان هەفتا ئەسیریان فرۆشت و لەبەرابەردا زێریان وەرگرت). ئەسیرەکان هەفتا کەس بوون. لەسەر ئەم بنەمایە، لەشەڕی ئوحوّد هەفتا موسوڵمان لەسزای فرۆشتنی هەفتا ئەسیر کوژران. ددانی پێشەوەی پێغەمبەر(د.خ) شکا، خودەکەی لەسەریدا وردبوو، خوێن لەروخساری دەرکەوت، هاوەڵەکانی بەقورسی تێکشکان و خوا ئەم ئایەیی نارد: ئایا ئێوە لەسەر ئەو بڕوایەن کاتێك گیرۆدەی ئازارێك دەبن کەدوو ئەوەندەتان ئازاردابێت، بڵێن: ئەمە لەکوێوەیە؟ بڵێ: ئەمە دواهاتی کاری خۆتانە و خوا بۆ هەر کارێك بەتوانایە. (ال عمران ٣/١٦٥)

هەموو ئەو کەسانەی لەموسوڵمانان لەشەری بەدر کوژران، چواردە کەس بوون، شەش لە موهاجیرەکان و هەشت لەئەنسار. پێغەمبەر(د.خ) ئەو کەسانەی لەشەڕ گەڕاندەوە کە بەکەم تەمەنەی دەزانین، وەك: عەبدوڵڵە کوڕی عومەر، رافیع کوڕی خەدیج، بەرائ کوڕی عازەب، زەید کوڕی سابت و ئوسەید کوڕی حوزەیر.

پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەو هەشت کەسەی لەشەڕی بەدر ئامادە نەبوون، بەشێك لەتالآنییەکانی شەڕی لەبەرچاو گرت: عوسمان کوڕی عەففان کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدابوو لەمەدینە بمێنێتەوە و پەرستاری کچە نەخۆشەکەی پێغەمبەر(د.خ) یانی ڕوقیە بکات، تەڵحە کوڕی عوبەیداللە، سەعید کوڕی زەید کە

ئەم دووانەی بۆ لێکۆڵینەوە لەکاروانەکە و ئاگادار کردنەوەی ئەوان ناردبوو، باوکی لەبابە کەئەوی کردبووە جێگری خۆی لەمەدینە، عاسم کوڕی عودەی کەئەوی لەسەرەوەی شار دانابوو، حارس کوڕی حاتب کەئەوی لەبەر ئەوەی لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف بیستبوو، بۆ لای ئەوان گەڕاندبویەوە، حارس کوڕی سەمە کەلەشوێنێك بەناوی روحا شکەستی خواردبوو و خەوات کوڕی جوبەیر کەلێوی خوارەوەی شمشێرەکەی (زولفەقار) لەشەڕی بەدر شکابوو. ئەم شمشێرە هی مونەببە کوڕی حەجاج یا عاس کوڕی مونەببە بوو کەعەلی ئەوەی بەدەم ئەشکەنجەوە کوشت و شمشێرەکەی هەڵگرت و دای بەپێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) بەعەلی بەخشی.

## شەڕی مناڵەکانی قینقاع

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی بەدر گەڕایەوە، جوولەکەکان ڕژدی خۆیان لەبەرابەر ئەو سەرکەوتنەی خوا پێی بەخشیبوو، ئاشکرا کرد و ستەمیان کرد و پەیمانەکەیان شکاند. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) وەك کۆچکەرێك ڕووی لەمەدینە کرد، لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی بەست. کاتێك رژدی بردنی ئەوان بەپێغەمبەر(د.خ) گەشت، ئەوانی لەبازاری مناڵەکانی قینقاع کۆکردەوە و پێی وتن: ئاگادار بن و لەوەی بەسەر قورەیشییەکان هات، پەند وەربگرن و باوەڕ بەئیسلام بێنن چوونکە دەزانن من پێغەمبەری نێردراوی ئەوم. وتیان: ئەی محەممەد، لەخۆبایی مەبە کەڕووبەڕووی خەڵکانێك بویتەوە کەئاشنای هونەری شەڕ کردن نین و کەڵکت لەمە وەرگرت.

ئەمانە یەکەم جوولەکەکان بوون کەپەیمانی خۆیان لەگەڵ ئەودا شکاند. بەهەمان شێوە کەدوژمنایەتی خۆیان ئاشکرا دەکرد و لەسەر ناباوەڕی خۆیان نوقم ببوون، ڕۆژێك ژنێکی موسوڵمان ڕۆشتە بازاری مناڵەکانی قینقاع و لای زێڕنگەرێك دانیشت تا خشڵی بۆ دروست بکات. پیاوێك لەوان هات و کراسەکەی لەپشتەوە و بەشانییەوە بەست و ئەو ئاگای لێی نەبوو. کاتێك ژن هەستا، قونی دەرکەوت و

خەڵك پێی پێکەنین. یەکێك لەموسوڵمانەکان لەشوێنەکەی هەستا و ئەو پیاوەی بەشمشێر کرد بەدوولەت. جوولەکەکان پەیمانی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) شکاند و لەناو قەلاّ بەهێزەکانی خۆیان سەنگەریان گرت. پێغەمبەر(د.خ) بۆشەڕ لەگەڵ ئەوان ڕۆشتەدەر و ئەوانی بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ گەمارۆدا. ئەوان لەسەر فەرمانی ئەو هاتنە خوار و موسوڵمانەکان هەموویانیان بەستەوە چوونکە پێغەمبەری خوا دەیویست ئەوان کوشتار بکات. ئەوان هاوپەیمانانی خەزرەج بوون. لەم کاتەدا عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەلول ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و سەبارەت بەوان قسەی لەگەڵ کرد بەلاّم وەلاّمی دەستنەکەوت. ئەو یەخەی پێغەمبەری گرت کەپێغەمبەر(د.خ) توڕە بوو و وتی: هاوار لەتۆ، یەخەی من بەردە. عەبدوڵڵە کوڕی ئوبی وتی: یەخەی تۆبەرنادەم تا ئەوەی فەرمانی بەخشینی هاورێکانی من دەرکەیت و چاکەکاری خۆت نیشان بدەیت. چوارسەد کەس بێ زرێ و سێسەد کەس زرێپۆش لەبەرابەر هەر شتێك پاسەوانیان لەمن کرد، ئیستا دەتەوێت هەموویان لەبەرەبەیانێکدا لەناو ببەیت. سوێند بەخوا من ترسی زیانی مەترسیدارم هەیە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەمانە بۆ تۆ، نفرینی خوا لەوان بێت و لەتۆ.

پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانەکان هەموو سامانەکەی ئەوانیان وەك تالاّنی بۆخۆیان هەڵگرت. ئەوان خاوەن زەوی نەبوون بەڵکو کەسانێکی کاسب و پیشەوەر بوون. ئەوەی ئەوانی لەماڵەکانی خۆی دەرپەڕاند، عوبادە کوڕی سامتی ئەنساری بوو. ئەو ئەوانی تا زوباب دەرپەڕاند و ئەوان لەوێوە لە ئەزەرەعاتی شامەوە تێپەڕین تا خۆیان بگەیێنە فەلەستین بەلاّم زۆری نەخایاند هەموویان لەناوچوون.

پێغەمبەر(د.خ) باوکی لەبابەی لەمەدینە وەك جێگری خۆی دیاری کرد. ئالاّی پێغەمبەر(د.خ) لەدەستی حەمزەدا بوو. ئەو تالاّنی لەناو موسوڵمانەکاندا دابەش کرد وپێنج یەکی بۆخۆی هەڵگرت. بەوتەی هەندێ کەس، ئەمە یەکەم پێنج یەك بوو پێغەمبەر(د.خ) بۆخۆی هەڵگرت. دواتر پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و لەجەژنی قوربان دەرکەوت و لەگەڵ موسوڵمانان بەرەو نوێژگە ڕۆشتەدەر و ئەمە یەکەم نوێژی جەژنی قوربان بوو، ئەو خوێندی. پێغەمبەری خوا یەك یا دوو مەڕی قوربانی کرد

و ئەمە یەکەم قوربانی بوو موسوڵمانەکان بینیان. لەگەڵ ئەو، بەتواناکانیش قوربانیان کرد. شەڕ لەمانگی شەوال(ئاوریل) ٦٢٤ زایینی ڕوویدا. هەندێك دەڵێن: شەڕ لەمانگی سەفەری ساڵی سێیەمی کۆچی / ژوئیەی – ئوتی ٦٢٤ زایینی ڕوویدا. هەندێك مێژووەکەی بۆ دوای شەڕی کودەر دەگەڕێننەوە.

## شەڕی کودەر

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەم شەڕە لەشەواڵی ساڵی دووەمی کۆچی / ئاوریلی ٦٢٤ زایینی ڕوویدا. واقدی دەڵێت لەموحەرەمی ساڵی سێیەمی کۆچی/ ژوئەنی ٦٢٤ زایینی ڕوویدا. پێغەمبەریان ئاگادار کردەوە کەمناڵەکانی سەلیم لەسەر ئاوێك بەناوی کودەر کۆبونەتەوە. پێغەمبەر(د.خ) بەرەو کودەر ڕۆشت بەڵام شەڕی نەکرد. ئاڵاکەی لەدەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دابوو. ئەو، عەبدوڵڵە کوڕی دایکی مەکتومی لەمەدینە وەك جێگری خۆی دیاری کرد. گەڕایەوە و چواریێ و شوانەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنا. گەشتنی ئەو بۆ مەدینە، لەشەوی دەیەم لەشەوال/٥ ئاوریلی ٦٢٤ زایینی بوو. دوای گەشتنی بۆ مەدینە، غالب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی لەگەڵ دەستەیەك شەڕکەر بۆ شەڕی مناڵەکانی سەلیم و مناڵەکانی غەتەفان ڕەوانەکرد. ئەوانیان کوشتار کرد و مەڕومالاتەکانیان بەتالانی گرت. لەموسوڵمانەکان سێ کەس گیانیان لەدەستدا. شەڕکەران لە نیوەی شەوال/١١ ئاوریل ٦٢٤ زایینی بۆ مەدینە گەڕانەوە.

## شەڕی سویق

ئەبو سوفیان دوای شەڕی بەدر پەیمانی بەستبوو دوای هیچ جوتبونێك لەگەڵ ژنان سەر و روخساری بەئاو نەشوات تا شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بکات. ئەو لەگەڵ دوسەد پیاوی شەڕکەر لەقورەیشییەکان هاتەدەر تا سوێندەکەی خۆی بەجێ هێنابێت. خۆی شەوانە گەیاندە مەدینە و چاوی بە سەلام کوڕی مێشکم سەروەری نەزر کەوت و باس و خواسی خەڵکانی لەو بیست و لەهەمان شەو گەڕایەوە و چەند پیاوێکی ڕەوانەی مەدینە کرد. ئەوان هاتن بۆ(عورەیز) و دارخورماکانی ئەوێیان ئاگر تێبەردا و پیاوێك لەئەنسار وپیاوێك لەهاوپەیمانانی ئەویان کوشت. ناوی پیاوی ئەنساری مەعبەدی کوڕی عەمرۆ بوو. ئەوان گەڕانەوە و ئەبوسوفیان بینی سوێندەکەی خۆی بەجێ هێناوە. لەم لاوە، ئەم هەواڵە بەمەدینە گەشت و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هاوەڵانی خۆی سواربوون و شوێنیان کەوتن بەڵام نەیانتوانی بیانگرن. ئەبوسوفیان و هاوەڵانی هەمانە ئاردەکانیان فرێدەدا تا خۆیان بار سوك بکەن و رزگاریان بێت. زۆربەی توێشوی ئەوان ئەمە بوو. لەبەر ئەمە بەشەڕی ئارد ناویان بردووە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ موسوڵمانەکان گەڕانەوە، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا هێوای شەڕێکی تر هەیە؟ وتی: بەڵێ. ئەبوسوفیان لەهەمان کات کەخۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکرد، دەیوت:

| | |
|---|---|
| کروا علی یثرب و جمعهم | فان ما جمعوا لکم نفل |
| ان یك یوم القلیب کان لهم | فان ما بعدة لهم دول |
| الیت لا اقرب النساء و لا | یمس راسی و جلدی الغسل |
| حتی تبیروا قبائل الاوس و الخز | رج ان الفواد یشتعل |

واتاکەی: هێرش بکەنە سەر یەسرب و دەستەکانی، چوونکە ئەوەی کۆیان کردۆتەوە، تالانی ئێوەیە. ئەگەر شەڕی بەدەر لەبەرژەوەندی ئەوان کۆتایی هات، شەڕەکانی دواتر دەبێتە هۆی زیان و زەرەری ئەوان. سوێند دەخۆم لەگەڵ ژناندا

نەخەوم و سەر و روخساری خۆم نەشۆم تا هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج لەناو ببەم چوونکە ئاگر لەدڵی مندا بڵێسە دەسەنێت.

کەعب کوڕی مالیك بەم شێوە وەڵامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| یا لهف ام المسبحین علی | جیش بن حرب بالحرة الفشل |
| اذ یطرحون الرحال من سئم الطیـ | ـر ترقی لقنة الجبل |
| جاؤوا بجمع لو قیس مبرکة | ما کان الا کمفحص الدئل |
| عار من النصر و الثراء و من | ابطال اهل البطحاء و الاسل |

واتاکەی: هاوار لەدایکی وەسفکەران بۆ سوپاکەی کوڕی حەرب ئەبوسوفیان بێت کە لەحەرە گرفتاری چ شکەست و بەزینێك بوون. ئەو کاتەی باروبنەی خۆیان فرێدەدایە سەر زەوی و هەرکەس لەباڵندەکان بێزار بێت ڕوودەکاتە بەرزایی چیاکان. سوپایەکیان کۆکردەوە ئەگەر شوێنخەوەکەی هەڵبسەنگێنرێت، لەشوێنخەوی مشك گەورەتر نییە. دوور لەسەرکەوتن و توانایی و خاڵی لەپاڵەوانەکان دۆڵی زیخەڵان و ڕمە گیان سێنەکان.

لەمانگی زیحەججە/ مەی٦٢٤ زایینی عوسمان کوڕی مەزعون مرد ولەبەقیع بەخاك سپێردرا. پێغەمبەر(د.خ) بەردێکی لەسەر ئارامگاکەی دانا تا نیشانەیەك بۆ ئەو بێت.

دەستەیەك دەڵێن: حسین کوڕی عەلی لەم ساڵەدا لەدایك بوو. دەستەیەك دەڵێن: عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوای دوانزە مانگ لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە لەگەڵ فاتیمە پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. ئەگەر ئەمە راست بێت، وتاری یەکەم ناراستە.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) ئەو خوێنباییانەی دیاری کرد کەپەیوەندیان بەشمشێرەکەی ئەوەوە بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێیەمی کۆچی ٦٢٥ زایینی

لەموحەرەمی ساڵی سێیەم/ ژوئەنی ٦٢٥ زایـینی پێغەمبەر(د.خ) بیستی دەستەیەك لەمناڵەکانی سەعلەبە لای سەعد کوڕی زوبیان و مناڵەکانی موحارب کوڕی حەفس کوبوونەتەوە تا زیان لەموسوڵمانەکان بدەن. ئەو بەچوارسەد پیاوی شەڕکەر ڕووبەڕوویان بوویەوە و کاتێك گەشتە زی قەسە، چاوی بەپیاوێك لەمناڵەکانی سەعلەبە کەوت و پێشنیاری ئیسلامی پێکرد. ئەو باوەڕی هێنا و پێغەمبەری ئاگادار کردەوە کەبتپەرستەکان شەوانە هەواڵی هاتنی ئەویان بیستووە و ڕوویان لەبەرزایی کوێستانەکان کردووە. ئەو بێ ئەوەی شەڕ بکات، بۆ مەدینە گەڕایەوە. مانەوەی ئەو دوانزە شەوی خایاند.

لەم ساڵەدا لەجەمادی ئەلئەوەل/ ئوکتۆبەر پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی مناڵەکانی سەلیم ڕوویکردە (بوحران). هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو دەستەیەك لەمناڵەکانی سەلیم لەبوحران لەبەشی (فەرع) کۆببوونەوە و هەواڵی ئەم کارە بەپێغەمبەر گەیشت. ئەو لەگەڵ سێسەد پیاوی شەڕکەر ڕۆشتەدەر و کاتێك گەشتە بوحران، بینی ئەوان بڵاوەیان لێکردووە. ئەو بێ ئەوەی ڕووبەڕووی شەڕ ببێتەوە، گەڕایەوە. هاتنەدەرەوەی ئەو لەمەدینە دە شەوی خایاند. ئەو عەبدوڵڵە کوڕی مەکتومی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دیاری کردبوو.

## کوژرانی کەعب کوڕی ئەشرەفی جوولەکە

لەم ساڵەدا کەعب کوڕی ئەشرەف یەکێك لەخەڵکی مناڵەکانی نەبهان لەبنەماڵەی تەی کەدایکی لەمناڵەکانی نەزیر بوو، کوژرا. کوژرانی بتپەرستەکان لەشەڕی بەدر بۆ ئەو زۆر ناخۆش بوو. لەبەر ئەمە ڕۆشتە مەککە و خەڵکی ئەوێی دژی پێغەمبەر(د.خ) راپەڕاند. بنەماڵەی ئەم کوژراوانە بەکوڵ گریان. ئەو لەوتار و قەسیدەکانی خۆی ناوی ژنە موسوڵمانەکانی دەبرد و بەوتە خۆشەویستی لەگەڵ

ئەم ژنە داوێن پاکانەدا دەکرد تا ڕادەیەك کەئەوانی ئازار دەدا. کاتێك بۆ مەدینە گەڕایەوە پێغەمبەر(د.خ) وتی: چ کەسێك کەعب کوڕی ئەشرەف لەسەر ڕێگای من لادەبات. محەممەد کوڕی مەسلەمە وتی: من ئەم کارە بۆ تۆ ئەنجام دەدەم و دەیکوژم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر ئەتوانی ئەم کارە بکە. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە ناچارین هەندێ قسە بکەین( لەوانەیە ناچار بین بەخراپی ناوی تۆ ببەین) پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوەی بۆ ئێوە ئاشکرایە، بۆ ئێوە ڕەوایە.

محەممەد کوڕی مەسلەمە و سێکان کوڕی سەلامە کوڕی وەقش و حارس کوڕی ئەوس کوڕی مەعاز برای شیری کەعب و عەباد کوڕی بوشر و باوکس عەبس کوڕی جەبر کۆبوونەوە و پێش لەخۆیان باوکی نایلەیان بۆ لای کەعب کوڕی ئەشرەف نارد تا گفتوگۆی لەگەڵدا بکات و بەوی وت: ئەی کوڕی ئەشرەف، من بۆ کارێك بۆ لای تۆ هاتووم، ئەو کارە لەمن بشارەوە. وتی: ئەو کارە دەکەم. باوکی نایلە وتی: هاتنی ئەم خەڵکە بۆ عەرەبەکان شووم بوو چوونکە ڕێگاکانی ئێمەی بەست و نانخۆرەکانمان تەنگ و چەڵەمەیان بۆ دروست بوو و چوارپێکان لەزمان کەوتن. کەعب وتی: من تۆم لەم کارە ئاگادار کردبویەوە. باوکی نایلە وتی: دەمەوێت خواردنمان پێ بفرۆشیت و ئێمە لای تۆ بارمتە دادەنێین و لەگەڵ تۆ پەیمانێکی بەهێز دەبەستین و تۆ کارە چاکە لەگەڵ ئێمە دەکەیت. کەعب وتی: کوڕەکانتان لای من وەك بارمتە دابنێن. باوکی نایلە وتی: دەتەوێت ڕیسوام بکەیت. هاوڕێکانم لەگەڵ مندان و بۆچوونی هاوشێوەی منیان هەیە. تۆ خواردن بەوان دەفرۆشیت و ئێمە بەئەندازەی پێویست (چەنبەرە) لای تۆ دادەنێین. مەبەستی باوکی نایلە لەچەنبەرە کەرەستەکانی شەڕ کردن بوو کەکاتێك لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی بەکەرەستەی شەڕەوە بچنە لای کەعب، بۆ ئەو نائاشنا نەبێت و نەترسێت. کەعب وتی: چەنبەرە بەس بێت.

باوکی نایلە بۆ لای هاوڕێکانی خۆی گەڕایەوە و ئاگاداری کردنەوە. کەل وپەلی شەڕیان هەڵگرت و بەرەو لای کەعب بەڕێکەوتن. پێغەمبەر(د.خ) تا بەقیعی غەرقەد هاوڕێیەتی ئەوانی کرد و لەخوا بۆ ئەوان پاڕایەوە. کاتێك گەشتنە ماڵی کەعب، باوکی نایلە بانگی کرد. کەعب تازە لەپەردەی زاوایەتیی هاتبووەدەر. باوکی نایلە

بەرەو لای ڕۆشت و ئەوان بۆ ماوەیەك گفتوگۆیان كرد. كەعب هاوریٚ لەگەڵ ئەوان بەرەو دۆڵی عەجوز بەرێكەوت. لەم كاتەدا باوكی نایلە دەستی بۆ سەری كەعب كوڕی ئەشرەف برد و بۆنی كرد و وتی: تا ئەمشەو بۆنێكی بەم خۆشیەم بۆن نەكردبوو. ماوەیەكیتر ڕۆشتن و دووبارە ئەو كارەی دوبارە كردەوە تا كەعب ئارامی گرت. پاش كەمێكیتر ڕۆشتن لەناكاو پشتەملی كەعبی گرت و هاواری كرد: دوژمنی خوا بكوژن. شمشێرەكانی ئەوان یەك لەدوای یەك هاتنە خوار، بەڵام هیچ ئەنجامێكی لیٚ نەكەوتەوە. موحەممەد كوڕی مەسلەمە دەڵێت: بیرم كەوتەوە لەناو شمشێرەكەی خۆمدا قامچییەكم پێیە كەلەناویدا شمشێرێكی بچوكە. هەڵم گرت. دوژمنی خوا بەشێوەیەكی واقیژاندی كەلەهەموو قەڵاكانی دەوروبەری ئێمە ئاگر پێكرا. شمشێرەكەم خستە سەر سینەی و تا سەرەو هێلكە گونیم هەڵدڕی و دوژمنی خوا كەوتە سەر زەوی.

لەم ناوەدا، حارس كوڕی ئەوس كوڕی مەعاز برینداربوو چوونكە شمشێری یەكێك لەئێمەی بەرجەستەی كەوت. ئێمە بەرەو بوعاس بەرێكەوتین. ئەو دوا كەوت و ماوەیەك درەنگی كرد چوونكە گیرۆدەی خوێنبەربوون ببو. هاتە لای ئێمە، ئێمە هەڵمان گرت و بردمانە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەومان لە كوژرانی دوژمنی خوا ئاگادار كردەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئاوی دەمی لەبرینی بریندارەكە سوو و ئێمە بۆ لای ماڵ و منداڵی خۆمان گەڕاینەوە. جوولەكەكان بەتەواوی ترسان و هیچ جوولەكەیەك نەما مەگەر ئەوەی ژیانی خۆی لەمەترسیدا ببینێت.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) وتی: دەستتان بەهەركام لەپیاوان و گەورەكانی جوولەكە كەوت، بیانكوژن. موحەیسە كوڕی مەسعود هێرشی كردە سەر كوڕی سونەینەی جوولەكە لەبازرگانەكانی جوولەكە كەلەگەڵ ئەودا ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەكرد و كوشتی. براكەی حوەیسە پێی وت: ئەی دوژمنی خوا، ئەوت كوشت! سوێند بەخوا هەموو چەورییەكانی سكی تۆ لەسامانی ئەوە! ئەو لەبراكەی خۆیدا. موحەیسە وتی: كەسێك فەرمانی كوشتنی ئەوی بەمندا كە ئەگەر فەرمانی كوشتنی تۆی پیٚ دەدام، درەنگم نەدەكرد و تۆیشم دەكوشت. دەڵێت: سوێند بەخوا ئەمە بووە سەرەتایەك بۆ باوەڕهێنانی حوەیسە چوونكە وتی: ئایینێك بەمشێوە كاریگەری

لەسەر تۆ دابنێت، جێی سەرسوڕمانە. دواتر باوەڕی هێنا.

لە ڕەبیع ئەلئەوەلی ئەم ساڵە /ئوتی ٦٢٤ زاییینی عوسمان کوڕی عەففان لەگەڵ کچێکیتری پێغەمبەر(د.خ) پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست (دایکی کولسوم) و لەمانگی جەمادی السانی/ نۆڤەمبەر لەناو پەردە لەگەڵیدا خەوت. هەروەها لەم ساڵەدا، سایب کوڕی زەید خوشکەزای ئەمیر چاوی بەدنیا هەڵهێنا. واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی ئەنمار ڕۆشتەدەر. بەم شەڕەیان وتووە دەوام. پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق لەمبارەوە داوە.

لەم ساڵەدا شەڕی فەردە ڕوویدا و فەرماندەکەی زەید کوڕی حارسە بو. ئەمە یەکەم شەڕ بو بەفەرماندەیی زەید کوڕی حارسە.

داستانی ئەم شەڕە بەوشێوەبوو: قورەیشییەکان دوای شەڕی بەدر، لەڕێگەی شام ترسان و ڕێگەی عێراقیان گرتەبەر. لەوان دەستەیەك ڕۆشتنەدەر کەئەبو سوفیان کوڕی حەرب و سەفوان کوڕی ئومەییە لەناویاندا بوون. زۆربەی کاڵا بازرگانییەکانی شام زیو بوو. فورات کوڕی حەیان لەبەکر کوڕی وایل ئەوانی ڕێنوێنی دەکرد. پێغەمبەر(د.خ)، زەیدی نارده سەر ئەوان و لەئاوێك بەناوی فەردە ڕووبەڕوویانبوویەوە و کاروانەکەی گرت و هەرچی لەناو کاروانەکەدا بوو، زەوتی کرد. سامانی کاروانەکەی هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ) کەیەك لەسەر پێنجی بیست هەزار و هەمووی سەد هەزار بوو. ئەو چوار لەسەر پێنجی بەسەر هاورێکانی خۆی دابەش کرد. فورات کوڕی حەیانی بەدیلی هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو باوەڕی بەئیسلام هێنا و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ئازاد کرد.

## کوژرانی باوکی رافع

لەجەمادی الثاني ئەم ساڵە/ نۆڤەمبەر٦٢٤ زاییینی باوکی رافع سەلام کوڕی ئەبی حەقیقی جوولەکە کوژرا. ئەو هاوکاری کەعب کوڕی ئەشرەف دەکرد دژ بەپێغەمبەر(د.خ). کاتێك کەعب کوڕی ئەشرف کوژرا و بکوژەکانی لەئەوس بوون، خەزرەجییەکان وتیان: سوێند بەخوا ناتوانن بەم کارەیان لای پێغەمبەر(د.خ) شانازی بەخۆیانەوە بکەن. ئەوس و خەزرەج لەهاوکاری کردنی پێغەمبەر(د.خ) وەك

دوو وشتری نێر کێبڕکێیان دەکرد. خەزرەجییەکان چەندین کەسیان بیرهێنایەوە کەوەك کەعب کوڕی ئەشرەف دوژمنایەتی پێغەمبەریان دەکرد. ئەوان کوڕی ئەبی حەقیقیان دەست نیشان کرد کەلەپاشماوەکانی خەیبەر بوو. لەپێغەمبەر(د.خ) بۆ کوشتنی ئەوفەرمانیان ویست و فەرمانیان پێدرا. لەخەزرەجییەکان عەبدوڵڵە کوڕی عەتیك و مەسعود کوڕی سینان و عەبدوڵڵە کوڕی ئەنیس و باوکی قەتادە و خوزاعی کوڕی ئەسوەد، هاوپەیمانی ئەوان ڕۆشتنەدەر. پێغەمبەر(د.خ) عەبدوڵڵە کوڕی عەتیکی کردە فەرماندەی ئەوان. ئەوان ڕۆشتن تا گەشتنە خەیبەر و شەوانە ڕۆشتنە ماڵی باوکی رافع. لای هیچ ماڵێکەوە تێنەپەرین مەگەر ئەوەی لەدەرەوە درگایان لەسەر ئەندامانی ماڵەکە داخست. باوکی رافع لەماڵەکەیدا بوو. داوای مۆڵەتی چوونە ژورەوەیان کرد. ژنەکەی هاتەدەر و پرسی: کێن؟ وتیان: دەستەیەك لەعەرەبەکان کەخواردن (گەنم، جۆ، دانەوێڵەمان) دەوێت. ژن وتی: ئەمە هاورێکەی ئێوە، بڕۆنە لای. ئەوان ڕۆشتنە ژوور، کاتێك چوونە ژور، درگای ماڵەکەیان داخست و ئەویان لەناو جێگاکەیدا بینی و هێرشیانکردە سەری. ژنەکەی قیژاندی. چەندین جار ئەوان دەیانویست ژنەکەی بکوژن بەلام راسپاردەکەی پێغەمبەریان بیردەکەوتەوە کە دەیوت ئازار بەژن و منداڵەکان مەگەیێنن، دواتر دەستیان لێهەڵگرت. ئەوان بەشمشێرەکانی خۆیان لێیاندەدا و عەبدوڵڵە کوڕی ئەنیس بەشمشێرەکەی خۆی پەلاماریدا و شمشێرەکەی لەسکیدا چەقاند. دواتر هاتنەدەر. چاوەکانی عەبدوڵڵە کوڕی عەتیك بەجوانی نەیدەبینی، لەپلیکانەکان کەوتەخوار و قاچی بەسەختی ئازاری پێگەشت. هەڵیانگرت و شاردیانەوە. جوولەکەکان ڕوویان لەهەر شوێنێك کرد بەلام ئەوانیان بۆ نەدۆزرایەوە. گەڕانەوە بۆ لای هاورێکەی خۆیان. موسوڵمانەکان وتیان: چۆن بزانین دوژمنی خوا مردووە؟ یەکیان گەڕایەوە و ڕۆشتە ناو خەڵکەکە و خەڵکی لەدەوروبەری خۆی دەبینی، دەیوت: دەنگی باوکی رافعم ناسییەوە. وتم: باوکی رافع لەکوێیە؟ ئەوسا ژنەکەی قیژاندی: سوێند بەخوا باوکی رافع گیانی ئەسپەردە کردووە. وتی: سوێند بەخوا قسەیەك لەمە خۆشترم نەبیستبوو. بۆ لای هاورێکانی گەڕایەوە و ئەم هەواڵەی پێراگەیاندن. ئەو دەنگی جارچی مردنی بیست کەدەیوت:

هەواڵی کوژرانی باوکی رافعی بازرگانی حیجازییەکانتان پێ دەدەم. گەڕانەوە تا گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و سەبارەت بەکوژەرەکەی کێشە هاتە ئاراوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: شمشێرەکانی خۆتان بێنن. شمشێرەکانیان هێنا. پێغەمبەر(د.خ) سەیری شمشێرەکانی کرد وسەبارەت بەشمشێرەکەی عەبدوڵڵە کوڕی ئەنیس وتی: ئەم شمشێرە ئەوی کوشتووە چوونکە نیشانی ئێسقانەکانی تیا دەبینم.

هەروەها سەبارەت بەکوژرانی وتراوە: پێغەمبەر(د.خ) چەندین پیاوی لەئەنسار بەفەرماندەیی عەبدوڵڵە کوڕی عەتیك بۆ لای باوکی رافعی جوولەکە نارد کە لەسەرزەمینی حجاز مابوویەوە و ئازاری پێغەمبەری دەدا. کاتێك لەو نزیکبوونەوە، خۆر ئاوابوو، خەڵك بە چراوە بەرێگادا دەڕۆشتن. عەبدوڵڵە کوڕی عەتیك بەهاورێیانی وت: لەشوێنەکانی خۆتان بمێننەوە و من دەڕۆم بەنەرمی لەگەڵ دەرگاوان قسە دەکەم، لەوانەیە بتوانم بڕۆمە ژوور. ڕۆشت تا گەشتە نزیك دەرگاکە و لەوێ جامانەکەی لەسەرییەوە پێچا وەك بڵێی دەیەوێت کارێك ئەنجام بدات (گمیز بکات). دەرگاوان بانگی کرد: ئەگەر دەتەوێت بێیتە ناو، وەرە کەدەمەوێت دەرگاکە دابخەم. ڕۆشتە ژور و دەرگاکانی بەست و کلیلەکانی بەبزمارێکەوە هەڵواسی. دەڵێت: هەستام و کلیلەکانم هەڵگرت ودەرگام کردەوە. باوکی رافع لەسەرەوەیماڵەکەی خۆی لەگەڵ خەڵکانیتر سەرقاڵی شەونشینی بوو. کاتێك ویستی بخەوێت، خەڵکان لای ئەو ڕۆشتن و من چوومە سەر. هەر دەرگایەکەم دەکردەوە، لەناوەوە لەسەر خۆم دامدەخست. وتم: ئەگەر لەبوونم ئاگادار ببنەوە، بەمن ناگەن تا دەیکوژم. دەڵێت: پێی گەشتم و بینیم لەژورێکی تاریك لەناو خێزانەکەی خۆیدایەتی بەلام نازانم کوێیە؟ وتم: ئەی باوکی رافع! وتی: ئەوە کێیە؟بەرەو دەنگەکە ڕۆشتم (گێژبووم) و بەشمشێر لێمدا بەلام نەکوژرا و قیژاندی. لەماڵ هاتمەدەر، بەلام دوورنەکەوتمەوە و دواتر هاتمە بەردەگاکە و وتم: ئەم هاوارە بۆ چییە؟ وتی: هاوار لەدایکت! پیاوێك لەماڵەکەدایە کە بەشمشێر لێیدام. دەڵێت: دووبارە بەشمشێر لێمدا بەلام نەمکوشت. ئەوسانوکی شمشێرەکەم خستەسەر سکی و زەختم لێکرد تا لەپشتییەوە هاتەدەر. زانیم کوشتوومە. دەستم

بەکردنەوەی دەرگاکان کرد و ڕۆشتمەدەر تا گەشتە لای قادرمەکان و گومانمکرد گەشتومەتە خوار. مانگە شەوبوو. قاچم هەڵگرت و دامنا و کەوتمەخوار و قاچم شکا. بەدەستارەکەی خۆم بەستم و لای دەرگاکە دانیشتم، وتم: سوێند بەخوا لێرە ناڕۆم تا بزانم کوشتوومە یا نە. کاتێك کەڵەشێر خوێندی، جارچی مردن جاڕیدا: هەواڵی مردنی باوکی رافعی بازرگانی حجاز رادەگەیێنم. ڕۆشتمە لای هاوڕێکانم و وتم: ڕاکەن! خوا باوکی رافعی کوشت. گەشتمە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەم باس و خواسەم بۆ باس کرد. وتی: قاچت درێژکە. درێژم کرد و ئەو دەستی بەسەر قاچمدا هێنا وەك بڵێی هیچ کاتێك ئازارم نەبووبێت.

دەستەیەك دەڵێن: کوژرانی باوکی رافع لەزیحەججەی ساڵی چوارەمی کۆچی/ مەی٦٢٦ زایینی ڕوویداوە و خوا زاناترە.

لەم ساڵەدا لەشەعبان/ ژانویە٦٢٥زایینی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ حەفسە کچی عومەر کوڕی خەتاب پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەو پێشتر ژنی خونەیس کوڕی حوزافەی سەهمی بوو کەمرد.

## شەڕی ئوحود

ئەم شەڕە، دوای تێپەڕینی حەوت شەو لەشەوالی ئەم ساڵە/ ٢٣ مەی ٦٢٥ زایینی یا نیوەی ئەو/٣١مەی ٦٢٥ زایینی ڕزویدا. هۆکاری ئەم شەڕە، شەڕی بەدر بوو چوونکە دەستەیەك لەبتپەرستان لەم شەڕەدا کوژران، عەبدوڵڵە کوڕی باوکی ڕەبیعە و عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل و سەفەوان کوڕی ئومەییە و کەسانیتر کەباوك و کوڕیان لەم شەڕەدا کوژرابوو و هەروەها ئەو کەسانەی سامانیان لەناو کاروانەکەدا بوو، ڕۆشتنە لای ئەبو سوفیان و قسەیان لەگەڵدا کرد تا بەسامان لەشەڕ دژی پێغەمبەر(د.خ) هاوکاری بکەن و تۆڵەی خۆیان بستێننەوە. ئەم کارەیان کرد و خەڵکی خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد و کەرەستە و ساز و بەرگی شەڕیان تەیار و چوارکەسیان بۆ لای عەرەبەکان نارد تا ئەوانیش هانبدەن: عەمرۆ کوڕی عاس، هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهەب، کوڕی زەبعەری و باوکی عەزەی جومەحی. چەندین دەستەیان لەکەنانە و سەقیف و شوێنەکانیتر کۆکردەوە. قورەیشییەکان لەگەڵ

هاوپەیمانەکان و شوێنکەوتووان و لایەنگرانی خۆیان لەهۆزەکانی تەهامە و کەنانە کۆبوونەوە. جوبەیر کوڕی مەتعەم کۆیلەکەی، وەحشی کوڕی حەربی بانگ کرد و ئەو بەشێوەیەك زوبینی دەهاویشت کەهەڵەی نەدەکرد. جوبەیر پێی وت: لەگەڵ خەڵکەکە بڕۆ و ئەگەر مامی پێغەمبەر(د.خ) لەتۆڵەی مامی من، توعەیمە کوڕی عودەی بکوژی، ئازادیت. ئەوان، ژن و منداڵی خەڵکەکەیان لەگەڵ خۆیان برد تا ڕانەکەن. ژنەکەی، هند کچی عوتبەی لەگەڵ خۆی برد و گەورەکانیتری قورەیش ژنەکانی خۆیان هەڵگرت. عیکرمە کوڕی ئەبی جەهل ژنەکەی دایکی حەکیم کچی حارس کوڕی هوشامی لەگەڵ خۆی برد. حارس کوڕی موغەیرە ژنەکەی فاتیمە کچی وەلید کوڕی موغەیرە خوشکی خالید، سەفوان کوڕی ئومەییە ژنەکەی بەریرە یا بەرەزە کچی مەسعود دایکی کوڕەکەی عەبدوڵڵە کوڕی سەفوان، عەمرۆ کوڕی عاس ژنەکەی ریتە کچی مونەبە کوڕی حەجاج دایکی کوڕەکەی عوبەیداللە کوڕی عەمرۆ، تەڵحە کوڕی ئەبی تەڵحە ژنەکەی سولافە کچی سەعد دایکی کوڕەکانی موسافیع و جولاس و کەلاب و کەسانیتر هەرکام ژنەکەی خۆیان لەگەڵ خۆیان برد. ژنان دەفیان پێ بوو و بۆ کوژراوانی شەڕی بەدر دەگریان و هانی بتپەرستەکانیان دەدا.

هاوڕێ لەگەڵ بتپەرەستەکان، باوکی عامری پارسای ئەنساری بوو کەبۆ دووربوون لەپێغەمبەر(د.خ) هاوڕێ لەگەڵ پەنجا یا پانزە کوڕ لەئەوسیەکان ڕۆشتبوو بۆ مەککە. ئەو مزگێنی بەقوڕەیشییەکان دەدا ئەگەر شەڕ لەگەڵ محەممەد بکات، هەموو ئەوسیەکان یارمەتی دەدەن. کاتێك خەڵك لەئۆحۆد ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، باوکی عامر یەکەم کەس لەناو هاوپەیمانان و خەڵکانی مەککە بوو، هاتەدەر و وتی: ئەی ئەوسییەکان، من باوکی عامرم. وتیان: خوا تۆ نەبەخشێت، ئەی پیاوی خراپەکار! وتی: خەڵکانی من لەدوای من گیرۆدەی زیان بوون. دواتر ئەو زۆر بەسەختی شەڕی کرد بەشێوەیەك لەهەردولاوە بەردیان بۆیەك دەهاویشت. هەرجار هند لای وەحشی تێدەپەڕی یا ئەو دەگەشتە لای هند ( و وەحشی بەباوکی دوسمە – قەڵەو- ناودەبرد) دەیوت: ئەی ئەبو دوسمە، دڵی خەڵکانیتر رازیکە و دڵی خۆت شادمان. هاتن تا لەناو زەوییە سوێر و ئاودارەکانی لەسەر کارێزێك

لەقەراغی دۆڵ لای مەدینە باریان خست.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەم هەواڵەی بیست و موسوڵمانان ئاگادار بوونەوە، وتی: گایەکەم لەخەودا بینیوە و فاڵێکی باشم پێ گرتۆتەوە. لەلێوی شمشێرەکەم درزێکم بینی و هەروەها بینیم لەخەودا دەستم خستۆتە ناو زرێیەك و بەو شێوە لێکمدایەوە لەمەدینە بمێنمەوە ( و شەڕ هەڵگیرسێنم). ئەگەر بتانەوێت دەتوانن لەمەدینە بمێننەوە و ئەوان بکێشنە ئێرە، ئەگەر بمێننەوە، لەخراپترین شوێندا دەمێننەوە و ئەگەر ڕووبەڕووی ئێمە ببنەوە، لێرە شەڕیان لەگەڵ دەکەین.

بۆچوونی عەبدوڵڵە کوڕی ئوبی سەلول سازگار بوو لەگەڵ بۆچوونەکەی پێغەمبەر(د.خ) چوونکە حەزی نەدەکرد لەمەدینە بڕۆنەدەر. دەستەیەك لەو کەسانەی لەم ڕۆژەدا گیانیان ئەسپەردە کرد، خوازیاری ڕۆشتنە دەرەوە لەمەدینە بوون بۆ شەڕ لەگەڵ بتپەرستان.

قورەیشییەکان ڕۆژەکانی چوارشەممە و پێنجشەممە و هەینی مانەوە. پێغەمبەر(د.خ) دوای ئەوەی نوێژی هەینی خوێند، ڕۆشتەدەر و هەردوو لای شەڕکەر لەرۆژی شەممە نیوەی شەوال/٣١ مەی پێکەوە شەڕیان کرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) جل وبەرگی شەڕی لەبەر کرد و ڕۆشتەدەر، ئەوانەی دەنگیان بۆ شەڕ کردن لەدەرەوەی مەدینەدا بوو، پەشیمان بوونەوە و وتیان: پێغەمبەری خوامان بۆ ڕۆشتنەدەرەوە ناچار کرد. ئێستا داوای لێدەکەین چاوەڕوانی وەحی بکات تا بێتەخوار. چوونە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای لێخۆشبوونیان کرد و وتیان: هەرچیت ئەوێت، ئەوە بکە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: شیاو نییە بۆ پێغەمبەریك زرێ لەبەر بکات و دایبنێتەوە مەگەر ئەوەی شەڕی کردبێت.

پێغەمبەر(د.خ) هاورێ لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر ڕۆشتەدەر و عەبدوڵڵە کوڕی دایکی مەکتومی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دیاریکرد. کاتێك گەشتە نیوەی ڕێگەی مەدینە تا ئۆحۆد، عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی یەك لەسەر سێی خەڵکەکەی گەڕاندەوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەوان فەرمانی برد و نافەرمانی منی کرد. ئەوانەی فەرمانیان لەو دەبرد، خەڵکانێکی ڕیاکار و سست باوەڕ بوون. عەبدوڵڵە کوڕی حەرام برای منداڵەکانی سەلمە بەدوای ئەواندا ڕۆشت و خوای بیرخستنەوە کە

دەست لەهاوکاری کردنی پێغەمبەر(د.خ) هەڵنەگرن و بەتەنیایی نەهێڵنەوە. وتیان: ئەگەر دەمانزانی ئێوە پیاوی شەڕن، بەتەنیا جێمان نەدەهێشتن. شوێنکاری خۆیان کەوتن. عەبدوڵڵە کوڕی حەرام وتی: خوا دوورترتان بکاتەوە، ئەی دوژمنانی خوا! خۆزگە خواوەند ئێمە لەئێوە بێ نیاز بکات. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ حەوت سەد پیاوی شەڕکەر مایەوە. ئەو لەسەر زەوی بەردەڵانی مناڵەکانی حارسە و لەناو سامانەکانی ئەوانەوە تێپەڕی و دارایی پیاوێك لەڕیاکاران بەناوی مێربەع کوڕی قەیزی هەڵگرت کەپیاوێکی کوێربوو. کاتێك دەنگی پێغەمبەر(د.خ) و دەنگی پێی ئەو و هاوەڵانی بیست، لەشوێنەکەی هەستا و خاك و خۆڵی کرد بەسەروچاویاندا. بەردەوام دەیوت: ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوایت، پێم باش نییە بێیتە ناوبێستان و کێڵگەکەی من. مشتێ خۆڵی هەڵگرت و وتی: ئەگەر دەمزانی ئەم خۆڵە بەر ڕوخساری کەس ناکەوێت، دەمکرد بەڕوخساری تۆدا. هاوڕێکانی پێغەمبەر(د.خ) ویستیان بیکوژن. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەو کارە مەکەن، ئەم پیاوە هەم چاوی کوێرە و هەم دڵی. سەعد کوڕی زەید بەکەوانەکەی خۆی لەسەریدا و بریندارى کرد.

لەم ناوەدا ئەسپێك ڕەمی کرد و کلکی لەقاند و لەکالآنی شمشێری سوارەکەی خۆیدا و دەریکێشا. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: شمشێرەکانی خۆتان بگرن کەئەمڕۆ شمشێری زۆر لەکالآن دەردەکێشرێت.

پێغەمبەر(د.خ) بەڕێکەوت تا لەقەراغ دۆڵەکە دابەزی و پشتی خۆی و سوپاکەی کردە ئوحود. بتپەرستەکان سێ هەزار پیاوی شەڕکەر بوون کەحەوتسەد کەسیان زرێیان پۆشیبوو. دووسەد کەسیان ئەسپ سوار و پانزە کەسیان ژنانی خۆیان بەکەژاوەی ڕازاوەوە هێنابوو. موسوڵمانەکان دووسەد کەسیان زرێیان لەبەردابوو و تەنیا دوو ئەسپ: یەکیان هی پێغەمبەر(د.خ)و ئەویتریان هی ئەبی بوردەی کوڕی نیار. پێغەمبەر(د.خ) بەسەر سوپاکەیدا گەڕا و زەید کوڕی سابت و کوڕی عەمرۆ و ئوسەید کوڕی حوزەیر و بەرا کوڕی عازەب و عەرابە کوڕی ئەوس و باوکی سەعیدی خدری و هەندێکیتری گەڕاندەوە. فەرمانی بەجابر کوڕی سەمورە و ڕافع کوڕی خەدیجی دا لەگەڵ ئەودابن.

ئەبوسوفیان پەیك و پەیامی بۆ لای ئەنسارییەکان ڕەوانە کرد و وتی: ئێمە

لەگـەڵ کـوڕە مامەکـەمان بەتـەنیا جێبـێڵن تـا شـەڕ لەگـەڵ ئێـوە نەکـەین چـوونکە پێویستمان بەکوشتاری ئێوە نییە. ئەنسارەکان بەتوندی وەڵامیان دایەوە.

بتپەرستەکان خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. خالید کوڕی وەلیدیان لەلای راستی سوپاکەی خۆیان دانا و عیکرەمە کوڕی ئەبی جەهلیان لەباڵی چەپی سوپاکەی. ئاڵاکەیان لەناو منداڵەکانی عەبدئەلدار بوو. ئەبوسوفیان ڕوویکردە ئاڵا هەڵگرەکان و وتی: بەردەوام شەڕکەران ڕوودەکەنە ئاڵاهەڵگرەکان تا بیانکوژن. یا ئاڵاکە تەسلیم بەئێمە بکەن یا پیاوانە بیپارێزن. وتیان: کاتێك شەڕ دەسپێبکات، دەبینی چۆن شەڕ دەکەین. ئەو ئەمەی دەویست.

پێغەمبەر(د.خ) ڕوویکردە مەدینە و کوێستانی ئۆحۆد لەپشت سەریەوە بوو، تیرهاوێژەکان کەپەنجا کەس بوون، لەدواوەی سوپاکەی خۆی جێگیر و عەبدوڵڵە کوڕی جوبەیری وەك فەرماندەیی ئەوان دیاری کرد. پێی وت: بەتیرهاویشتن، سوارەکان لەئێمە دووربکەرەوە تا لەپشتەوە هێرش نەکەنە سەر ئێمە و لە شوێنی خۆتان بمێننەوە چ شەڕەکە لەبەرژەوەندی ئێمە کۆتایی بێت چ لەزیانی ئێمە. پێغەمبەر(د.خ) دو زرێی پۆشی و ئاڵاکەی بەمەسعەب کوڕی عومەیر بەخشی و زوبەیر کوڕی عەوامی کردە فەرماندەی سوارەکان و میقدادی کردە هاوڕێی. حەمزە لەپێش ئەوانەوە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بەرێکەوت.

خالید و عێکرەمە ڕۆشتن و زوبەیر و میقداد لەگەڵ ئەواندا خۆڕاگرییان کرد و دوژمنیان تێکشکاند. تەلحە کوڕی عوسمان ئاڵاداری بتپەرستەکان هات ووتی: ئەی هاوڕێیانی موحەممەد، ئێوە گومان دەکەن خوا بەشمشێرەکانی ئێوە ئێمە بۆ دۆزەخ دەبات و ئێوە بەشمشێرەکانی ئێمە بۆ بەهەشت. ئایا لەناو ئێوەدا کەسێك هەیە شمشێرەکەی من ئەو بۆ بەهەشت ببات و شمشێرەکەی ئەو من بۆ دۆزەخ؟ عەلی کوڕی ئەبی تالیب هێرشیکردە سەر و بەشمشێر لێیدا و قاچی پەڕاند. کەوتە خوار و قونی دەرکەوت. عەلی بەخوا و خزمایەتی سوێنددا لەخوێنی خۆش بێت. عەلی وازی لێ هێنا. پێغەمبەر(د.خ) هاواری کرد: خوا گەورەیە. ئەوسا بەعەلی وت: بۆ نەت کوشت؟ وتی: منی بەخوا و خزمایەتی سوێندداو لەلایەکیتر قونی ڕووت بوو)، من شەرمم کرد خوێنی بڕێژم.

لەدەستی پێغەمبەر(د.خ) شمشێرێك بوو. بانگیدا: كێ ئەم شمشێرە وەردەگرێت و حەقەكەی بەمن دەدات. چەندین پیاو روویان تێكرد كەشمشێرەكەی بەهیچ كامیان نەدا تا ئەبو دوجانە رۆشتە پێش و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ، حەقی ئەم شمشێرە چییە؟ وتی: ئەوەی، ئەوەندە لەدوژمن بكوژیت تا خوێن برێژێت. وتی: من هەڵیدەگرم. پێغەمبەر(د.خ) شمشێرەكەی پێدا. پیاوێكی بوێر بوو. دەستارێكی سووری هەبوو كەكاتێك لەسەری دەبەست، خەڵكان دەیانزانی چۆن شەڕ دەكات. دەستارە سوورەكەی بەست و شمشێری هەڵگرت و بەنازە و لەنجەوە بەرەو پێشەوە رۆشت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەمە، رێگە رۆشتنێكە، خوا رقی لێیەتی مەگەر لەئاوا شوێنێك. رووبەرووی هیچ شەڕكەرێك نەدەبوویەوە مەگەر ئەوەی خوێنی دەڕشت. سەرئەنجام گەشتە ژنەكان لەسەر بەرزایی چیاكە كەدەفیان پێ بوو و لێیاندەدا و دەیانخوێند و سەمایان دەكرد. لەناو ئەواندا ژنێك بوو دەیخوێند:

نحن بنات طارق — نمشي على النمارق

ان تقلبوا نعانق — و نفرش النمارق

او تدبروا نفارق — فراق غير وامق

هەروەها دەیوت:

ايها بني عبد الدار — ايها حكاة الديار

واتاكەی: ئێمە كیژانێكین شەوانە لەدەرگای دولبەر دەدیەن. لەسەر جێگەی نەرم و شل دەخەوین. ئەگەر بێنە پێش، ئێوە لەئامێز دەگرین و جێگاكان رادەخەین. ئەگەر پشتمان تێكەن، جیایی هەڵدەبژێرین بەشێوەیەك ئیتر ئێوەمان خۆش نەوێت.

ئێستا بڕۆنە پێش ئەی كوڕانی عەبدئەلدار، بڕۆنە پێش ئەی پاسەوانان و پشتیوانانی كەسوكار، هێرش بكەن بەشمشێرە گیان سینەكان.

شمشێرەكەی بەرز كردەوە تا ئەو ژنە دوولەت بكات بەلام شمشێری پێغەمبەری خوای لەپیس بوون بەخوێنی ژنێك پاراست. ئەم ژنە، هند بوو. ژنان لەپشت سەری ئەو دەفیان لێدەدا و پیاوانیان هاندەدا.

خەڵك بەسەختی شەڕیان كرد. لەناو شەڕكەرە موسوڵمانەكان حەمزە و عەلی و

ئەبو دوجانە ڕۆشتنە ناو دڵی سوپای دوژمن. خوا سەرکەوتنی بەموسوڵمانەکان بەخشی و بتپەرستەکانی تێکشکاند. ژنان ڕایان کرد و ڕوویانکردە بەرزایی کوێستانەکان. موسوڵمانەکان هێرشیانکردە سەر لەشکرگاکەی ئەوان و دەستیان بەتاڵانکردنی کرد. کاتێك ناباوەڕان پاشەکشێیان کرد، هەندێك لەتیرهاوێژەکان سەیری لەشکرگەیان کرد و دەستیانکرد بەکۆکردنەوەی تاڵانییەکان و ئەوانی تر لەشوێنی خۆیان مانەوە و وتیان: بەتەواوی گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) دەبین و لەشوێنی خۆمان دەمێنینەوە. خوا ئەم ئایەی نارد: هەندێك لەئێوە بوون ئەم دنیایان خۆش دەویست و هەندێك ئەو دنیا (ال عمران/٣/١٥٢). ئەوانە هاوەڵە ڕاستەقینەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون.

عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود دەڵێت: گومانم نەدەکرد هیچ کام لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ئەم دنیایان خۆش بوێت تا ئەم ئایە دابەزی.

کاتێك ژمارەیەك لەتیرهاوێژەکان لەشوێنەکانی خۆیان هاتنەخوار، خالید کوڕی وەلید ئەو ژمارەکەمەی تیرهاوێژەکانی بینی و هێرشیکردە سەریان و ئەوانی کوشت و لەپشتەوە هێرشی کردە سەر پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی. کاتێك بتپەرستەکان بینیان سوارەکانیان شەڕدەکەن، ڕوویانکردە گۆڕەپانی شەڕ و هێرشیان کردەسەر موسوڵمانەکان شکستیاندان. موسوڵمانەکان ئاڵاهەڵگرەکەی بتپەرستەکانیان کوشتبوو و ئاڵاکە لەسەر زەوی و کەس هەڵینەدەگرتەوە. لەم کاتەدا عەمرە کچی عەلقەمەی حارسی هەڵیگرت و دایچەقاند. قوڕەیشییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و سواب هەڵیگرت و لەوێدا کوژرا. ئەوەی ئاڵاهەڵگرەکانی کوشت، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. باوکی ڕافع بەمشێوە دەڵێت. کاتێك ئەوانی کوشت، پێغەمبەر(د.خ) ژمارەیەك لەبتپەرستەکانی بینی و بەعەلی وت: هێرش بکەرە سەر ئەوان. ئەو بڵاوەی بەوان کرد و کوشتاری کردن. ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) ژمارەیەکیتری بینی وپێی وت: هێرش بکەرە سەر ئەوان. عەلی هێرشیکردە سەر ئەوان و بڵاوەی پێکردن و لەکوشتاری ئەوان خوێنی زۆری ڕشت. جبرەئیل وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، گیانبازی وبرایەتی ئەمەیە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەو لەمنە و منیش لەوم. جبرەئیل وتی: منیش لەئێوەم. دەڵێت: لەم کاتەدا دەنگێکیان بیست

کەهاواری دەکرد: شمشێرێك وەك زولفەقار نییە و جوامێرێك وەك عەلی.

یەکێك لەددانەکانی خوارەوەی پێغەمبەر(د.خ) شکا و لێوی قەڵیشا و روخسار و کوڵمی بریندار بوو. کوڕی قیمئە شمشێری بەرز کردەوە لەپێغەمبەر(د.خ) بدات. ئەو بوو پێغەمبەری بریندار کرد. دەستەیەك دەڵێن: عوتبە کوڕی ئەبی وەقاس یا عەبدوڵڵە کوڕی شەهابی زوهری باوەگەورێی محەممەد کوڕی موسلیم ئەوی بریندار کرد.

دەڵێن: عوتبە کوڕی ئەبی وەقاس و کوڕی قیمئە لەیسی ئەدرەمی لەمناڵەکانی تەمیم و مناڵەکانی دارم (کەپیاوێکی چەناکە کورت و چەناکە شکاو بوو) و ئەبی کوڕی خەلەف جومەحی و عەبدوڵڵە کوڕی حومەید ئەسەدی (شێری شەڕی قورەیشییەکان) لەسەر کوشتنی پێغەمبەر(د.خ) هاودەست بوون. ئەم شەهابە ئەو کەسەیە ناوچاوانی بریندار کرد. عوتبە چوار خڕە بەردی هەڵگرت و یەکێك لەددانەکانی لای راستی شکاند و لێوی قەڵیشاند. کوڕی قیمئە کوڵمی بریندار کرد بەشێوەیەك ئاڵقەی خودەکەی تیایدا چەقی. شمشێری لەسەری پێغەمبەردا بەڵام کاریگەری بەجێنەهێشت و خودەکەی نەشکاند. پێغەمبەر(د.خ) کەوتە سەر زەوی و ئەژنۆی بریندار بوو. ئەبی کوڕی خەلەف بەزوبین هێرشیکردە سەر. پێغەمبەر(د.خ) زوبینەکەی لێ سەند و بەهەمان زوبین کوشتی. دەستەیەك دەڵێن: نا، بەوشێوە نییە، ئەو زوبینی زوبەیر کوڕی عەوامی هەڵگرت و ئەبی کوڕی خەلەفی پێ کوشت. دەستەیەکیتر دەڵێن. لەحارس کوڕی سەمەی وەرگرت. عەبدوڵڵە کوڕی حەمید بەدەستی ئەبودوجانەی ئەنساری کوژرا.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بریندار بوو، خوێن بەروخساریدا هاتەخوار. بەردەوام دەستی لێ دەدا و دەیوت: چۆن خەڵکێك رزگاریان دەبێت کاتێك روخساری پێغەمبەری خۆیان خوێناوی بکەن. ئەو لەدەست ئەوان لەدەرگای خواوەند ناڵاندی. پێنج کەس لەئەنسار لەبەردەم پێغەمبەر شەڕیان دەکرد و هەموویان کوژران. ئەبو دوجانە جەستەی خۆی کردە قەڵغانی پێغەمبەر(د.خ). خۆی خستبووە سەر پێغەمبەر(د.خ) و لەهەر لایەکەوە تیر دەهات لەپشتی ئەو دەچەقی. سەعد کوڕی ئەبی وەقاس لەپێش پێغەمبەر)ەوە تیری دەهاویشت و پێغەمبەر(د.خ) تیری پێ

دەدا و دەیوت: تیر بهاوە، دایك و باوكم قوربانت بن.

لەم ڕۆژەدا چاوی قەتادە كوڕی نەعمان دەرتۆقی و پێغەمبەر(د.خ) بەدەستی خۆی خستییەوە جێگا و ئەم چاوە، بوو بەباشترین چاو بۆ ئەو. موسعەب كوڕی عومەیر ئالآی موسوڵمانەكانی گرتە دەست و ئەوەندە شەڕی كرد تا گیانی سپارد. ئەو بەدەستی كوڕی قیمئەی لەیسی كوژرا و گومانی دەكرد ئەو پێغەمبەرە. ئەو بۆ لای قوڕەیشییەكان گەڕایەوە و وتی: محەممەدم كوشت. لەبەر ئەمە خەڵك هاواریان كرد: محەممەد كوژرا. محەممەد كوژرا.

كاتێك مەسعەب كوژرا، پێغەمبەر(د.خ) ئالآكەی بەعەلی كوڕی ئەبی تالیب سپارد. حەمزە سەرقاڵی شەڕ بوو تا سیباع كوڕی عەبدلعوزەی غوبشانی لایەوە تێپەڕی. حەمزە پێی وت: ئەی زادەی ئەو ژنەی قیتكەی ژنان دەبڕێت، وەرە لای مـن! دایكی ئەنمار، ژنێك بوو كچانی خەتێنە دەكرد. كاتێك ڕووبەڕووی یەك وەستان، حەمزە لێیدا وكوشتی. وەحشی (كۆیلەكەی هند) دەڵێت: سوێند بەخوا حەمزەم دەبینی بێ ترس خەڵكانی دروێنە دەكرد و لای هەركەسێك تێدەپەڕی دەیكوشت. ئەو سیباع كوڕی عەبدولعوزەی كوشت. زوبینەكەی خۆم ڕاوەشاند و بۆم هاویشت كەلەناوكی چەقی و لەنێوان دوقاچییەوە هاتەدەر. ویستی پەلامارم بدات بەلآم نەیتوانی و كەوتە سەر زەوی. چاوەڕێ بووم تا گیانی سپارد و ئەوسا زوبینەكەم دەرهێنا وبەرەو لای سوپاكە ڕۆشتم. خوا لەحەمزە رازی بێت و ڕەزامەندی بكات.

عاسم كوڕی سابت، موسافع كوڕی تەڵحە و براكەی كەلاب كوڕی تەڵحەی بەدووتیر بۆ ئەو دنیا نارد. ئەو دووانەیان بردە لای دایكیان سولافە وپێیان وت عاسم هەردووكیانی كوشتووە. ئەو لەگەڵ خوا پەیمانی بەست ئەگەر خوا ئەو بەسەر عاسم دا زاڵ بكات لەكاسەی سەریدا شەراب بخواتەوە.

لەم كاتەدا عەبدولڕەحمان كوڕی ئەبی بەكر كەلەگەڵ بتپەرستەكان بوو، ڕۆشتە نێوان دوو سوپاكە و داوای شەڕكەری كرد. ئەبوبەكر ویستی پەلاماری بدات بەلآم پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: شمشێرەكەت بخەرە كالآن و ئێمە بەهرەوەر بكە.

ئۆنس كوڕی نەزری مامی ئۆنس كوڕی مالك لای عومەر و تەڵحە و چەندین پیاو

لەموهاجیرەکان تێپەڕی کەهەموویان شڵەژاو و پەرێشان بوون. بەوانی وت: بۆ لەشوێنی خۆتانا وشك بوون. وتیان: پێغەمبەر(د.خ) کوژراوە. وتی: دوای ئەو چ سودێك لەزیندوو مانەوە؟ لەسەر ئەو ئایین و کردەوە بمرن کەئەو مرد. دواتر ئەو ڕوویکردە سوپای بتپەرستان و ئەوەندە شەڕی کرد تا کوژرا. لەسەر جەستەی ئەو حەفتا برینی شمشێرو ڕمیان بینی. تەنیا خوشکەکەی بوو توانی بە پەنجە جوانەکانی بیناسێتەوە.

دەستەیەك دەڵێن: ئۆنس کوڕی نەزر دەستەیەك لەموسوڵمانانی بینی، کاتێك هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر(د.خ) بلاْوببوویەوە، دەیانوت: حۆزگە کەسێکمان هەبوایە بڕۆشتایەتە لای عەبدوللە کوڕی ئەبی سەلول تا ئەو بۆ ئێمە لەئەبو سوفیان ئەمان وەربگرێت بۆ ئەوەی نەمانکوژێت. ئۆنس بەوانی وت: ئەی خەڵکینە، ئەگەر محەممەد مردووە، خواکەی نەمردووە. لەسەر هەمان ئایین و کردار شەڕ بکەن کەمحەممەد کردی. خوایە، من لەوەی ئەوان دەیڵێن، داوای لێخۆش بوون دەکەم و لەوەی ئەم خەڵکانە وتیان، پەنا بۆ دەرگای تۆدەبەم. شەڕی کرد تا کوژرا.

یەکەم کەس پێغەمبەری بینی، کەعب کوڕی مالك بوو. دەڵێت: بێ درەنگ بەبەرزترین هاوار قیژاندم: ئەی موسوڵمانان، مزگێنیتان بێت پێغەمبەر(د.خ) زیندووە ونەکوژراوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئارام بە. کاتێك موسوڵمانەکان ئەویان ناسییەوە، بەرەو دۆڵەکە ڕۆشتن و بینیان کەعەلی، ئەبوبەکر، عومەر، تەڵحە، زوبەیر، حارس کوڕی سەمە و کەسانیتر دەوریان گرتووە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) پشتی لەدۆڵەکە کرد، ئەبی کوڕی کەعب خۆی پێگەیاند و وتی: ئەی محەممەد، زیندوو نەبم ئەگەر بێڵم تۆ زیندوو بیت. پێغەمبەر(د.خ) ڕوویتێکرد و بەزوبین لەملیدا. ئەبی بەردەوام لەمەککە بەپێغەمبەری دەوت: من وشترێکی پیرم هەیە ڕۆژانە یەك (فەرق) (پێوانەیەك لەخەڵکانی مەدینە بەرابەر لەگەڵ سێ ئاوخۆری) گەنمەشامی دەرخوارد دەدەم و ڕۆژێك لەرۆژەوکان سوار لەسەر ئەو تۆ ئەکوژم. پێغەمبەر(د.خ) پێی دەوت: بەڵکو من بەهاوکاری خوا تۆ ئەکوژم. کاتێك بریندار بوو و بۆ لای قوریشییەکان گەڕایەوە (برینەکەی سووك بوو) وتی: محەممەد منی کوشت. پێیان وت: مەترسیت لەسەر نییە. وتی: ئەو بەمنی وتووە کەدەتکوژم.

سوێند بەخوا ئەگەر تفی لەمن دەکرد، دەیکوشتم. دوژمنی خوا لەهەمان کاتدا گیانی دەرچوو.

پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی ئوحود بەسەختی هەوڵیدا و شەڕی کرد. ئەوەندەی تیرهاویشت تا تیردانەکەی خاڵی بوویەوە و سوچی کەوانەکەی شکا و زرێکەی لەت بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بریندار بوو، عەلی دەستی بەئاو هێنان لە(مێهراس) کێوێك لەئوحود، کرد و برینەکانی شۆرد. خوێن نەوەستایەوە. فاتیمە لەرێگاوە گەشت و باوەشی پیا کرد و بەخوڕ دەگریا. ئەوسا دەستەیەك قامیشی هێنا و ئاگری تێبەردا و خۆڵەمێشەکەی خستە سەر برینەکان و خوێنەکە وەستا.

مالك کوڕی زوهەیری حەشەمی تیرێکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاویشت کەتەڵحە دەستی خۆی کردە قەڵغان و تیر بەرپەنجە بچوکەکەی کەوت. دەستەیەك دەڵێن: حیبان کوڕی عەرەقە تیری بۆ هاویشت. کاتێك تیر بەرپەنجەی کەوت، وتی: ئاخ، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر دەیوت، ئاخ ئەی خوا! دەڕۆشتە بەهەشت و خەڵك سەیریان دەکرد. دەستەیەك دەڵێن: جگە لەپەنجە گەورە و پەنجەی ناوەڕاستی دەستی ئیفلیج بوو. وتاری یەکەم راستترە.

ئەبوسوفیان و دەستەیەك لەبتپەرستان ڕۆشتنە سەربەرزایی چیاکە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕەوا نییە، ئەوان لەسەروی ئێمەوە بن. عومەر و دەستەیەك لە موهاجیرەکان هەستان و شەڕیان لەگەڵ کردن و دووریانخستنەوە. پێغەمبەر(د.خ) کەودو زرێی لەبەردابوو، ڕوویکردە تاشبەردێك تا لێی بڕواتە سەر، بەڵام نەیتوانی. تەڵحە لەژێر قاچی دانیشت تا قاچی خستە سەرشانی ئەو و ڕۆشتە سەر. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەهەشت بۆ تەڵحە دەستنیشانکرا.

تێکشکان، دەستەیەك لەموسڵمانەکان و لەوان عوسمان کوڕی عەففان و کەسانیتری تا ئەعەوەس دوورخستەوە. ئەوان سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە و دواتر بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی، وتی: چۆڵەوانیتان بینی کەبەرەو ئەوێ ڕۆشتن!

لەم ناوەدا حەنزەلە کوڕی ئەبی عامر ناسراو بەناوی (ئەو کەسەی فریشتەکان دەشوات) چاوی بەئەبو سوفیان کوڕی حەرب کەوت. کاتێك حەنزەلە ڕووبەڕووی

وەستا، شەداد کوڕی ئەسوەد (کوڕی شەعوب) ئەوی بینی. ئەبوسوفیان بانگی کرد کەهات و هێرشیکردەسەر حەنزەلە و کوشتی. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فریشتەکان ئەو دەشۆن، لەکەس و کارەکەی بپرسن. کاتێك لەهاوسەرەکەیان پرسی، ئەو وتی: حەنزەلە لەیەکەم شەوی زاوایەتی لەگەڵ من خەوت و سەر و جەستەی نەشۆرد و یەکسەر بۆ گۆڕەپانی شەڕ رایکرد چوونکە دەنگی هاواری و ئاوازی شەڕی بیست. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەبەر ئەمەبوو فریشتەکان ئەویان شۆرد. ئەبوسوفیان سەبارەت بەخۆراگری خۆی و هاوکاری کوڕی شەعوب بۆ کوشتنی حەنزەلە، ئەم قەسیدەی هۆنییەوە:

ولو شئت نجتنی کمیت طمرة — و لم احمل النعماء لابن شعوب

فمازال مهری مزجر الکلب منهم — لدن غدوة حتی دنت لغروب

اقتالهم و ادعی یال غالب — و ادفعهم عنی برکن صلیب

فبکی و لاترعی مقالة عاذل — و لا تسأمی من عبرة و نحیب

اباك و اخوانا لنا قد تتابعوا — و حق لهم من عبرة و بنصیب

و سلی الذی قد کان فی النفس اننی — قتلت من النجار کل نجیب

و من هاشم قرنا نجیبا و مصعبا — و کان لدی الهیجا غیر هیوب

و لو اننی لم اشف منهم قورنتی — لکانت شجی فی القلب ذات ندوب

واتاکەی: ئەگەر دەمویست، سەمەندێکی سور و ڕەش و چالاك منی رزگار دەکرد، قورسایی بەخشینم نەدەخستە سەرشانی کوڕەکەم شعوب. جوانە ئەسپی ڕەم کردووم تا کاتی ئاوابوونی خۆر نیشانەی قولاندنی سەگەکانی ئەوان بوو. لەگەڵ ئەوان شەڕم دەکرد و دەمقیژاند: ئەی منالەکانی غالب! دواتر لەبەرابەر ئەوان پەنام بۆ ستونێکی بەهێز دەبرد و ئەوانم لەخۆم دووردەخستەوە، ئازیزەکەم، گریان دەسپێبکە و لەلۆمەی سەرکۆنەکەران مەترسە، لە شین وگریانیش بێزار مەبە. بۆ باوك و براکانت بگری کەیەك یەك بادەی مەرگیان نۆشی و هەنوکە ئەوان لەشین و گریان بەهرەیان پێدەبڕێت.ئەوەی لەدڵتا بوو بەمە ئارامی پێببەخشە کەمن هەر جوامێر نەژادێکم لە(نەجاریان) کوشت و لەناو برد. لەهاشمیەکان پاڵەوانی وەك هەمزەم لەخاکدا گەوزاند و هەروەها مەسعەب کەهیچ کاتێك لەشەڕ وجەنگ

نەدەترسا. ئەگەر دڵم بەکوشتنی ئەوان فێنك نەدەکردەوە، بەردەوام خەمێکی گیانبڕ، گیانمی ئازار دەدا.

حسان کوڕی سابت بەمشێوە وەڵامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| ذكرت القروم الصيد من آل هاشم | و لست لزور قلتة بمصيب |
| اتعجب ان اقصدت حمزة منهم | عشاً و قد سميته بنجيب |
| الم يقتلوا عمرا و عتبة و ابنه | وشيبة والحجاج و ابن حبيب |
| غداة دعا العاصي عليا فراعه | بصربة عطب بله بخصيب |

واتاکەی: سەروەرە سەرفرازەکانی بنەماڵەی هاشمت بەخراپی ناوبرد، لەو قسەی هێناتە سەرزمان، سوورنەبوویت. ئایا سەرت سوڕماوە کەلەناو ئەوان مەبەستی حەمزەت کرد و ئەوت بەشێری ژیان وپیاوێکی پاکنەژاد ناوبرد؟ ئایا ئەوان نەبوون کە لەئێوە عەمرۆ و عوتەبە و کوڕەکەی و شیبە و حەجاجیان کوشت؟ ئەو بەرەبەیانییەی ئەو پیاوە (عاسیە) عەلی بانگ کرد و بەشمشێری تیژ لەسەریدا بەشێوەیەك لەخوێنی خۆیدا سور بوو.

هندی جگەرخۆڕ و هاورێکانی خۆیان خستە سەر کوژراوەکان و ئەوانیان لەت لەت کرد و گوێ و لوتیان بڕین. هند خۆی گوێ و لوتە بڕاوەکانی کردە پاوانە و دەستەوانە و دواتر ئەوانی بەکۆیلەکەی، وەحشی سپارد. سینەی حەمزەی هەڵدری و جەرگی دەرهێنا و خستیە دەمی بەڵام نەیتوانی بیجوێت و لەبەر ئەمە تفی کردەوە.

ئەوسا ئەبوسوفیان لای خەڵکەکەی کۆبوویەوە و سێ جار وتی: ئایا محەممەد لەناو ئەم دەستەیە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: وەڵامی مەدەنەوە.دواتر سێ جار پرسی: ئایا کوڕی ئەبوقەحافە لەناو ئەم دەستەیە؟ دواتر سێ جار هاواری کرد: ئایا کوڕی خەتاب لەناو ئەم دەستەیە. دواتر ڕوویکردە هاوەڵانی خۆی و وتی: ئەمانە، هەموویان کوژراون. عومەر وتی: ئەی دوژمنی خوا، درۆت کرد. خوا ئەوانی بەزیندوویی هێشتەوە تا ببنە هۆکاری خەم و خەفەت بۆ تۆ. ئەبوسوفیان وتی:

هوبـەل، هوبـەل، تـۆ گـەورەییت. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: بڵـێ: خـوا، خـوا گـەورەترە. ئەبوسـوفیان وتـی: پرسـەمان هەیـە و پرسـەتان نییـە. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: بڵـێ: سەروەرمان خوایە کە لەگەڵ ئەودا بێگانەن. ئەبوسوفیان وتی: ئەی عومـەر، توخوا، راستیمان پێ بڵێ، ئایا محەممەدمان کوشتووە؟ عومەر وتی: بەخوا، نە. ئەو شاد و شادانە و گوێی لەوەڕینی تۆیە. ئەبوسوفیان وتی: تۆ راستگۆتر لە کوڕی قمئـەیت. دواتر وتی: ئەم شەڕە لەبەرابەر شەڕی بەدر. شەڕ بەردەوامە. ئێوە لەتوپـەت کردنـی کوژراوەکـانی خۆتـان دەبیـنن. سـوێند بـەخوا نـە بـەم کـارە شـادمان بـووم نـە لێـی نارازی. نە فەرمان بەم کارەدا، نەرێگەم لێ گرت.

لەم کاتەدا حولـەیس کوڕی زەببـان رابـەری هاوپەیمانـەکان لای ئەبوسـوفیانەوە و تێپەڕی و بینی نوکی ڕمەکەی لەدەمی حـەمزە دەچەقێنێت و دەڵێت: بیـچێژە، ئەی دابـڕاو لـەخزم و کەسوکار! حولـەیس هـاواری کـرد: ئـەی منداڵـەکانی کەنانـە ئەمـە گـەورەی قورەیـشە لەگـەڵ کـورە مامەکـەی خـۆی ئـەم کـارە دەکـات، ببیـنن. ئەبوسوفیان وتی: هەڵەیەك بوو، باسی مەکە.

دایکـی ئەیمـەن پەرستاری پێغەمبـەر(د.خ) و چەندین ژن لەئەنـسار ڕۆشتن سـەر ئاوەکە تا ئاو بێنن. حوبان کوڕی عەرەقە تیرێکی بۆ هاویشت کەبەر داوێنی کەوت. ئەو پێکەنی. پێغەمبەر(د.خ) تیرێکی بەسـەعد کوڕی وەقاسدا و وتـی: بیکوژە. ئـەو تیرەکـەی بـۆ هاویـشت و کوشـتی. پێغەمبـەر(د.خ) پێکـەنی و وتـی: سـەعد لەبەرژەوەنـدی ئـەو خاتونـە تۆڵـەی کـردەوە، خـوا داواکارییەکـەتی هێنایـەدی. خـوا لەتیرهاویشتندا سەرکەوتوت بکات.

ئەبوسـوفیان و هاوەڵـەکانی گەڕانـەوە. وتـی: ژوانـی ئێمـە لەگـەڵ ئێـوە سـاڵی داهاتووە. پێغەمبەر(د.خ) عـەلی بـەدوای ئـەوان نـارد و وتـی: بڕوانـە ئەگـەر لەئەسپ دابەزیون و سواری وشتر بوون، دەیانەوێت بۆ مەککە بڕۆن و ئەگەر سواری ئەسپن، دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر مەدینە. سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایـە، لەسەر مەدینـە تـا دوایین هەناسە خۆڕاگری دەکەم. عـەلی دەڵێت: بـەدوای ئەوانـدا ڕۆشـتم و بینـیم لەئەسپ دابـەزیون و سـواری وشـتر بـوون و دەیانـەوێت بـۆ مەککـە بڕۆن. ڕوومکردە پێغەمبەر(د.خ) و نەمتوانی خۆم بگرم و قیژاندم. پێغەمبـەر(د.خ)

فەرمانی پێدابوو ئەمە بەنهێنی بهێڵێتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەپیاوێکی فەرموو لەچۆنییەتی چارەنوسی کوژراوان بکۆڵێتەوە. ئەو سەعد کوڕی رەبیعی ئەنساری بینی نیوە گیانێکی هەیە. سەعد بەو پیاوەی وت: لەمنەوە سلاوی پێغەمبەر(د.خ) بگەیێنە و بلێ، خوا باشترین پاداشت دەدات بەخەڵکانێك کە پێغەمبەرێکیان لێهەڵدەبژێرێت. سلاوی کەسەکانم بگەیێنە و بلێ: ئەگەر کەمترین زیان بەپێغەمبەر(د.خ) بگات و ئێوە گیانتان لەجەستەدا بێت، هیچ بەڵگە و بیانویەکتان لای خوا نابێت. ئەمەی وت و گیانی ئەسپەردە کرد.

حەمزەیان لەناو دۆڵەکەدا دۆزییەوە، سکیان هەڵدڕی بوو و جەستەیان لەت لەت. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بینی، فەرمووی: ئەگەر ترسی ئەوە نەبوایە ئەم کارە دوای من ببێتە شتێکی باو، جەستەیەم لەسەر زەوی بەجێدەهێشت تا بڕواتە ناو سکی دڕندەکان و چینەدانی باڵندەکان. ئەگەر خوا من بەسەر قوڕەیشییەکاندا سەرکەوتو بکات، پەیکەری سی لەکوژراوانی ئەوان لەت لەت دەکەم. موسوڵمانەکان وتیان: بەشێوەیەك لەت لەتیان دەکەین کەعەربەکان هەرگیز وەك ئەوەیان نەبیستبێت. خوا ئەم ئایەیی لەمبارەوە ناردە خوا: ئەگەر تۆڵە دەسێننەوە، بەهەمان ئەندازە تۆڵە وەربگرنەوە کەستەمیان لەئێوە کردووە و ئەگەر خۆڕاگری بکەن، خۆڕاگری بۆ ئێوە باشترە (نحل/١٦/١٢٦). لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) لەم کارە چاوپۆشی کرد د و فەرمووی: هەرگیز جەستەی دوژمنەکانتان لەت لەت مەکەن.

سەفیە کچی عەبدولموتەلیب هات. پێغەمبەر(د.خ) بەکوڕی زوبەیری وت بیگەڕێنێتەوە تا نەبینێت چییان لەجەستەی حەمزە کردووە. زوبەیر ئەوی بینی و فەرمانی پێغەمبەری جێبەجێ کرد. سەفیە وتی: هەواڵم پێگەشتووە جەستەی براکەیان لەتلەت کردووم. ئەم کارە لەرێگەی خوادا زۆر کەمە. چەند شادمانن ئەو خەڵکانەی بەمشێوە چاوپۆشی دەکەن. بێگومان ئەم کارە بەخوا دەسپێرم و خۆڕاگری دەکەم. زوبەیر پێغەمبەر(د.خ) لەوتەکەی ئەو ئاگادار کردەوە. فەرمووی: رێگەی بدە بابێت. ژن هات و لەسەرجەستەی نوێژی خوێند، بەکوڵ گریا و دواتر وتی: هەمووان دروست کراوی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا و بەخاکیان سپارد.

لەناو موسوڵمانەکان کەسێك بەناوی (قوزمان) (پەست) بوو کەپێغەمبەر(د.خ) پێشتر وتبووی ئەو جەهەننەمیە. ئەو لەشەڕی ئوحود پیاوانەی شەڕی کرد و هەوڵیدا و هەشت یا نۆ کەس لەبتپەرستەکانی کوشت. دواتر برینداربوو و گەڕاندییانەوە بۆ ماڵ. موسوڵمانەکان وتیان: مژدەمان بەرێ قوزمان! وتی: بۆ دەبێت مژدە بدەم کەتەنیا بۆ پاسەوانی کردن لەناو و نیشان و مەزنی و ناوبانگی خەڵکەکەی خۆم شەڕم کردووە. لەم کاتەدا برینەکەی بەسەختی ئازاری پەیا کرد و لەبەر ئەمە، تیرێکی هەڵگرت و دەمارەکانی بازویی خۆی بڕی و خوێن فیچقەی کرد و گیانی سپارد. ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەر(د.خ) راگەیاند، وتی: شایەتی دەدەم کەمن نێردراوی خوام.

لەناو ئەو کەسانەی لەشەڕی ئوحود کوژران (موخەیریقی) جوولەکە بوو. ئەو لەو رۆژەدا بەجوولەکەکانی وت: ئەی جوولەکەکان، ئێوە بێ گومان دەزانن هاوکاری کردنی محەممەد راستە. وتیان: ئەمرۆ شەممەیە. وتی: بۆ من شەممەیەك لەئارادا نییە. ئەو شمشێر و کەلوپەلی شەڕی هەڵگرت و وتی: ئەگەر کوژرام سامانەکەم بەمحەممەد بسپێرن تا بەو جۆرەی دەخوازێت خەرجی بکات. بەرێکەوت و ئازایانە شەڕی کرد تا گیانی سپارد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: موخەیریق باشترینی جوولەکەکانە.

هەروەها لەم رۆژەدا یەمان باوکی حوزەیفە کوژرا. موسوڵمانەکان کوشتیان. پێغەمبەر(د.خ) سابت کوڕی قەیس کوڕی وەقشی بەهاوکاری ژمارەیەك لەژنان لەسەر زەوی نەهێشت. ئەو لەگەڵ هاوتاکەی خۆی (کەهەردووکیان پیر بوون) چاوەڕوانی شەڕیان دەکرد. یەکیان بەویتری وت: بۆ درەنگ بکەین؟ ئایا شمشێرەکانی خۆمان هەڵنەگرین و پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بین؟ لەوانەیە خوا ئەم گیانبازییەمان پێ ببەخشێت. ئەو کارەیان کرد و هاتنە ناو خەڵکان و کەس لەهاتنیان ئاگادار نەبوو. سابت بەدەستی بتپەرستەکان کوژرا و یەمان لەناو شمشێری موسوڵمانەکان کوژرا چوونکە نەیاندەزانی کێیە. حوزەیفە هاواری کرد: باوکم، باوکم! وتیان: سوێند بەخوا نەمانناسی. وتی: خوا لێتان خۆش بێت. حوزەیفە خوێنبایی ئەوی لەناو موسڵمانە هەژارەکان دابەش کرد.

هەندێ لەخەڵك، کوژراوەکانی خۆیان بۆ مەدینە بردەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەر کەسێك لەهەر شوێنێك کوژراوە، لەهەمان شوێن بەخاکی بسپێرن. فەرمانیدا دووان و سیان لەناو یەك قەبردا بشارنەوە و ئەوانەی خوێنەری قورئان بوون بەرەو کەعبە درێژ بکرێن. نوێژی لەسەر ئەوان خوێند. هەرجارە کەکوژراوێکیان دەهێنا، حەمزەی دەخستە پاڵی و نوێژێکی دەخوێند. دەستەیەك دەڵێن: نۆ کوژراوی لەسەر زەوی دانا و حەمزەی کردە دەیەم کەس و لەسەر ئەوان نوێژی خوێند. عەلی و ئەبوبەکر و عومەر و زوبەیر ڕۆشتنە ناو ئارامگاکەی ئەو و پێغەمبەر(د.خ) لای ئارامگاکە دانیشت. فەرمانیدا عەمرۆ کوڕی جەموح و عەبدوڵڵە کوڕی حەرام لەیەك ئارامگادا بەخاك بسپێرن. فەرمووی: ئەم دووانە لەم دنیا باشترین هاورێی یەك بوون.

کاتێك کوژراوان بەخاك سپێردران، پێغەمبەر(د.خ) ویستی بگەرێتەوە. لەرێی گەڕانەوە، حەمنە کچی جەحش چاوی پێیکەوت. پێغەمبەر(د.خ) هەواڵی کوژرانی براکەی عەبدوڵڵە کوڕی جەحشی پێدا. ژن وتی: هەمووان لای خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقره/٢/١٥٦). دواتر هەواڵی کوژرانی خاڵۆی، حەمزەی پێدا. ژن داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد. دواتر هەواڵی کوژرانی مێردەکەی مەسعەب کوڕی عەمیریان پێدا. ژن قیژاندی و دەستی بەشین و ڕۆڕۆ کرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مێرد لای ژن پێگەیەکی بەرزی هەیە.

پێغەمبەر(د.خ) لای هەرماڵێك لەئەنسارەوە کەتێدەپەڕی، فرمێسك لەچاوەکانی دەهاتنەخوار و بەکوڵ دەگریا و وتی: بەڵام هیچ ژنێك بۆ حەمزە شین ناگێڕێت. سەعد کوڕی مەعاز ڕۆشتە ماڵی منالەکانی عەبدئەلئەشهەل و فەرمانی بەژنەکانی ئەواندا بڕۆن وبۆ حەمزە شین بگێڕن.

پێغەمبەر(د.خ) لای ژنێك لەئەنسار تێپەڕی کەباوك و براکەی کوژرا بوون. کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەوانیان پێدا، وتی: پێغەمبەر(د.خ) چی بەسەر هات؟ وتیان: سوپاس بۆ خوا بەوشێوەیە کەدەیبینی. وتی: ئەوم نیشان بدەن. کاتێك ژن سەیری پێغەمبەری کرد، وتی: دوای مردنی تۆیە هەر مردنێك گیان ستێنە.

گەڕانەوەی ئەو بۆ مەدینە لەرۆژی شەممە و لەهەمان ڕۆژی شەڕ بوو.

## شەڕی حەمراءالاسد

ڕۆژی یەکشەممە (١٦ شەوالی/ یەکەی ژوئەنی ٦٢٥زایینی) بەیانی ئەو ڕۆژە، جارچی پێغەمبەر(د.خ) جاڕی شەڕی هەڵدا. پێغەمبەر(د.خ) وتی: تەنیا ئەو کەسانەی لەگەڵ ئێمە بێن کەدوێنێ لەگۆڕەپانی بەدر بوون. ڕۆیشت تا ناباوەڕان بزانن بەهەمان شێوە بەهێزە. لەگەڵ ئەو ژمارەیەك لەبریندارانیش ڕۆشتنەدەر کەبەدژواری خۆیان بەسەر پێوە دەگرت. سوپاکە بەرێکەوت تا گەشتە حەمرءالاسد لەحەوت میلی مەدینە. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆژەکانی دوشەممە و سێشەممە و چوارشەممە لەوێ مایەوە. لەم کاتەدا مەعبەدی خوزاعی لایەوە تێپەڕی. خوزاعییەکان لەموسڵمان و بتپەرەست بەچاکە خوازی بۆ پێغەمبەر(د.خ) بەتەهامە ناویان دەرکردبوو. مەعبەد بتپەرەست بوو. وتی: ئەی محەممەد، گرفتاری تۆئێمەی ناراحەت کرد. دواتر لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و کاتێك گەشتە ڕۆحا ، ئەبوسوفیان و کەسەکانی بینی کەدەیانویست بۆ مەدینە بگەڕێنەوە و پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانەکان بەگومانی خۆیان بەتەواوی لەناو ببەن. کاتێك ئەبوسوفیان مەعبەدی بینی، پەرسی: لەرێگادا کێت بینی؟ مەعبەد وتی: محەممەد لەگەڵ سوپایەکی گەورە کەهاوتاییم نەدیوە، هاتۆتەدەر و دەیەوێت هێرش بکاتە سەر ئێوە. ئەو هەموو کەسەکانی کۆکردۆتەوە چوونکە ئەوان لەکارەکەی خۆیان پەشیمانبوونەوە. لەشوێنی خۆت هەڵمەستە تا ببینی کەتەوێڵی ئەسپەکانی ئەوان دەرکەوتووە. ئەبوسوفیان وتی: سوێند بەخوا ئێمە دەمانەویست بگەڕێینەوە تا پاشماوەی ئەوان لەناو ببەین. مەعبەد وتی: ئاگادارت دەکەمەوە کەئەم کارە نەکەیت. ئەو بۆ هێرشبردن ڕێگری لەئەبوسوفیان و هاوڵانی گرت.

لەم کاتەدا کاروانێك لەمناڵەکانی قەیس لای ئەبوسوفیانەوە تێپەڕی. وتی: لای من پەیامێك بۆ محەممەد ببەن و من باری کشمیش لەوشترەکانی ئێوە دەدەم و دەیانبەمە عەکاز. وتیان: ئەو کارە دەکەین. وتی: ئاگاداری بکەنەوە ئێمە دەمانویست دوبارە هێرش بکەینە سەر ئەو و هاوەڵانی تا بەتەواوی لەناویان ببەین. ئەوان لەحمرءالاسەد لای پێغەمبەر(د.خ) تێپەڕین و هەواڵەکەیان

پێراگەیاند. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بۆ ئێمە خوا بەسە کەباشترین پشتیوانە. دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە و لەسەر ڕێگا باوکی عزە و عەمرۆ کوڕی عوبەیداللەی جومەحی و معاویە کوڕی موغەیرە کوڕی باوکی عاسی بینی. باوکی عزە لەشەڕی بەدر گرفتار ببوو. ئەو لەهەژاری و زۆری نانخۆرەکانی گلەیی بردە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) بێ هیچ خوێنباییەك ئازادی کرد بەلاَم پەیمانی لێوەرگرت شەڕ لەگەڵ موسوڵمانەکان نەکات و هاوکاری دوژمنانیان نەدات. ئەو لەشەڕی ئۆحۆد گەڕایەوە و خەڵکی دژی موسوڵمانەکان هاندەدا. کاتێك ئەویان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی محەممەد، لەمن خۆش ببە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: پیاوی خواپەرەست بۆ دووجار لەیەك کونەوە ناگەزێت. فەرمانیدا و کوشتیان.

بەلاَم معاویە کوڕی موغەیرە کوڕی باوکی عاس کوڕی ئومەییە، ئەو کەسە بوو لوتی حەمزە و کەسانیتری بڕی و جەستەی ئەوانی لەت لەت کرد. ئەو لەڕێگادا ون بوو و کاتێك بەرەبەیان گەیشت، ڕۆشتە ماڵی عوسمان کوڕی عەففان. کاتێك عوسمان بینی، وتی: خۆت و منت لەناو برد. معاویە وتی: تۆ نزیکترین خزمی منیت. هاتوومە لای تۆ تا پەنام بدەیت. عوسمان ئەوی بردە ماڵەکەی و خۆی و ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) تا ببێتە نێوەنجیگەر و ئازادی بکات. هەمان کات بیستی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: معاویە لەمەدینەیە، بگەڕێن و بیدۆزنەوە. ئەویان لەماڵی عوسمان هێنایەدەر و بردیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). عوسمان وتی: سوێند بەو کەسەی بەراستی و دروستی تۆی ناردووە، بۆ لای تۆ نەهاتم جگە لەوەی ئەمانی بدەیت. ئەو بەمن ببەخشە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەعوسمان بەخشی و سێ ڕۆژ مۆڵەتیدا و سوێندی خوارد ئەگەر تا ئەو سێ ڕۆژە نەڕوات بێ گومان خوێنی دەڕێژێت. عوسمان کەل و پەلی شەڕی پێدا و وتی: بڕۆ.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە حەمرائەلاسەد و معاویە مایەوە تا لەکاروباری پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار ببێتەوە. کاتێك ڕۆژی چوارەم هات، پێغەمبەر(د.خ) وتی: معاویە لەم نزیکانەیە و دور نەکەوتۆتەوە. بیدۆزنەوە. عەمار و زەید کوڕی حارسە بەدوایدا گەڕان و دۆزییانەوە و لەحەمات کوشتیان.

ئەم معاویە، باوەگەورێی دایکی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان بوو.

دەڵێن: لەم ساڵەدا لەنیوەی رەمەزان /رۆژی یەکەمی مارس ٦٢٥ زایینی حەسەن کوڕی عەلی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا فاتیمە کچی پێغەمبەر(د.خ) بە حسین کوڕی ئەبی تالیب سکی پڕ بوو. ماوەی نێوان مناڵبوون و دووگیانبوونی دوبارەی ئەو پێنج رۆژبوو.

هەروەها لەم ساڵەدا لە شەوال/مارس، جەمیلە کچی عەبدوڵڵە کوڕی باوکی عەبدوڵڵە کوڕی باوکی عامر(شۆردراو بەدەستی فریشتەکان) دووگیان بوو.(شەو مێردەکەی لەگەڵ ئەم ژنەدا زاوایەتی کرد و بەیانی یەکڕاست رۆشتە گۆڕەپانی شەڕ بێ ئەوەی خۆی بشوات و شەرابی شەهیدبوونی نۆش کرد و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەشۆردراو بەدەستی فریشتەکان ناو برد.

## ڕووداوەکانی ساڵی چوارەمی کۆچی (٦٢٥-٦٢٦)شەڕی ڕەجیح

لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر/ژوئیەیی ٦٢٥ زایینی شەڕی ڕەجیح ڕوویدا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو دەستەیەك لەعەزەل و قارە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) وتیان: ئیسلام لەناو ئێمەدا بڵاو بۆتەوە، چەندین کەس بۆ لای ئێمە بنێرە تا فێرکارییە دینییەکان وقورئانمان فێر بکەن. پێغەمبەر(د.خ) شەش کەسی بەفەرماندەیی عاسم کوڕی سابت یا مورسەدی کوڕی باوکی مورسەد ڕەوانەی سەرزەمینی ئەوان کرد. کاتێك گەشتنە هەدا(جێگەی ئارام)، فێڵیان کرد وداوای هاوکارییان لەبنەماڵەیك لەهوزەیل کرد کە بەمناڵەکانی لەحیان ناودەبران و ئەوان سەد پیاوی شەڕکەریان بۆ هاوکارییان نارد. موسوڵمانەکان پەنانیان بۆ چیاکە برد. بانگیان کردن بۆ خوارەوە و پەیمان و سوێندیان پێ بەخشین. عاسم وتی: سوێند بەخوا لەسەر بنەمای پەیمانیی ناباوەڕێك هاتینە خوار. خواوەندا: پێغەمبەر(د.خ) لەبارودۆخی ئێمە ئاگادار بکەرەوە. مورسەد و خالید کوڕی بوکیر شەڕیان کرد و کوڕی دەسینە و خوبەیب کوڕی عودەی و پیاوێکیتر هاتنەخوار کە بەتوندی ئەوانیان بەستەوە. پیاوی سێیەم وتی: ئەمە سەرەتای فێڵەکەیە. سوێند بەخوا شوێند ئێوە ناکەوین. ئەویان کوشت و خەبیب و کوڕی دەسینەیان بردە مەککە و فرۆشتیان. مناڵەکانی حارس کوڕی نەوفل خەبیبیان هەڵگرتەوە چوونکە ئەو بوو لەشەڕی ئۆحوّد حارسی کوشتبوو. ئەویان کڕییەوە تا لەتۆڵەی خوێنی حارسدا بیکوژن. لەم کاتەدا خەبیب لەماڵی کچەکانی حارس بوو. لەیەکێك لەوان تیغێکی بەقەرز وەرگرت تا مووە زیادەکانی خۆی پێ بتاشێت و بۆ کوژران ئامادە بێت. مناڵێك بەڕاکردن هات و لەسەر ئەژنۆی خەبیب دانیشت و ئەو تیغەکەی لەدەستا بوو. ژن قیژاندی. خەبیب وتی: دەترسی ئەو بکوژم. فێڵ کردن لەئایینەکەی ئێمەدا جێگەی نییە. ئەو ژنە بەردەوام دەیوت: هیچ کات ئەسیرێکم باشتر لەخەبیب نەدیوە. بەشێوەیەك ئەوم بینی کەبۆڵەترێی لەدەستا بوو و بەردەوام دەیخوارد بەجۆرێك لەهەموو مەککەدا میوە نەبوو و ئەمە بێگومان ڕۆژی

خوایی بوو کەبەخەبیبی بەخشیبوو.

کاتێـك خـەبیبیان لـەبارەگایی خـوایی بـردەدەر بـۆ ئـەوەی بیکـوژن، وتـی: بمگەڕێننەوە تا دوو رەکعەت نوێژ بخوێنم. ڕێگەیان پێدا نوێژ بخوێنێت و ئەمە بوو بەنەریتێك لەبارەی ئەو کەسانەی ئەشکەنجەیان دەکردن. دواتر خەبیب وتی: ئەگەر لەترسی ئەوە نەبوایە دەیانوت لەمردن دەترسێت نوێژی زیاترم دەخوێند. چەند دێرێکی خوێندەوە و لەوانە:

و لست ابالی حین اقتل مسلما      علی ای‌شیء کان فی اللة مصرعی

وذلك فی ذات الا له و ان یشا      یبارك علی اوصال شلو ممزع

واتاکەی: ئەگەر وەك موسوڵمانێك کوژرام، ترسم نییە بە چ بیانو و بەڵگەیەك لەرێگەی خوادا، لەخاك و خوێندا بتلێمەوە. ئەم کوژرانە بۆ گەوهەری پاکی خواییە کەئەگەر بیەوێت لەسەر جومگە جومگە و لەتەکانی جەستەم ئەرزانی دەبەخشێت و تیشکی خۆی بەسەردا بلاو دەکاتەوە.

دواتر وتی: خوا یەك یەکی ئەمانە دەستنیشان بکە و هەموویان بکەرە ئاماجی تۆڵەسەندنەوەی خۆت و بەکوشتارێکی سەراسەری هەموویان لەناو بەرە.

بەلام عاسم سابت، بەوشێوە بوو کەویستیان سەرەکەی بە سولافە کچی سەعد بفرۆشن و ئەو سوێندی خواردبوو لەکاسە سەری عاسم مەی بخواتەوە چوونکە ئەو یەکێك لەکورەکانی لەشەڕی ئوحوٚد کوشتبوو. هەنگەکان هاتن و هێرشیان کردە سەری و دەوری ئەویان گرت. وتیان: وازی لێبێنن تا رۆژ بکاتە شەو و دواتر دەیگرین. خواوەند بارانێکی زۆری باراند بەشێوەیەك دۆڵەکە لێوان لێوبوو لەئاو و جەستەی عاسمی لەگەڵ خۆیدا برد. ئەو لەگەڵ خوا پەیمانی بەستبوو دەستی بەهیچ بتپەرەستێك پیس نەکات و هیچ بتپەرەستێك نەتوانێت دەستی بەو بگات. خوا ئەوی لەکاتی مردنەکەی پاسەوانی کرد بەهەمان شێوە کەلەکاتی ژیاندا کردی.

بەلام کوڕی دەسینە، سەفوان کوڕی ئومەییە ئەوی لەگەڵ کۆیلەکەی خۆی نەستاس بۆ تەنعیم نارد تا ئەو لەبەرابەر خوێنی کوڕەکەی بکوژێت. نەستاس پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا ئایا حەز دەکەیت ئێستاکە محەممەد لەجیاتی تۆ لای ئێمە بێت تا ئێمە ئەو بکوژین و تۆ لەناو کەسەکانی خۆت بیت. وتی: حەز ناکەم

محەممەد لەو شوێنەی ئێستاکە لەوێیە، چقڵێك قاچی نازەنینی ئازار بدات و من زیندوو بم. ئەبوسوفیان وتی: هیچ کات نەمدیوە هیچ کەسێکیتریان بەو ئەندازەی هاوەڵانی محەممەد ئەویان خۆش دەوێت، خۆش بوێت. ئەوسا نەستاس ئەوی کوشت.

## ناردنی عەمرۆ کوڕی ئومەییە بۆ کوشتنی ئەبوسوفیان

کاتێك عاسم و هاوەڵانی کوژران، پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی ئومەییە زەمری لەگەڵ پیاوێك لەئەنسار بۆ مەککە نارد و فەرمانی پێدان تا ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بکوژن. عەمرۆ دەڵێت: من لەگەڵ وشتر و هاورێکەم هاتینەدەر و قاچی ئەو ئازاری هەبوو. من ئەوم سوار وشترەکەی خۆم دەکرد. ڕۆشتین تاگەشتینە ناو دۆڵی (بەتن یاجج). وشترەکەم بەستەوە و بەهاورێکەم وت: بابڕۆین ئەبوسوفیان بکوژین. ئەگەر لەشتێك ترسایت خۆت بگەیێنەرە وشترەکە و پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) ببە و ئاگاداری بکەرەوە و من بەجێبێڵە. ڕۆشتمە ناو شار و بەردەوام لەگەڵ ئەودا قسەم دەکرد. ڕۆشتینە ناو مەککە و من و خەنجێرێکم پێبوو، پێشتر ئامادەم کردبوو تا ئەگەر کەسێك ڕێگەم لێبگرێت، بیکوژم. هاورێکەم بەمنی وت: ئایا ناتەوێت کارەکەمان بەسوڕان بەدەوری ماڵی خوا دەستپێبکەین و دو ڕەکعەت نوێژ بخوێنین؟ وتم: خەڵکانی مەککە لەکۆڕەکانی خۆیان لەدەوری ماڵی خوا دادەنیشن و من بەم شارە ئاشناترم. بەردەوام ڕۆشتین تا گەشتینە ماڵی خوا و بەدەوری سوڕاینەوە و نوێژمان خوێند و دواتر هاتینە دەر و لای یەکێك لەکۆڕەکانی ئەوانەوە تێپەڕیین. یەکێك لەوان منی ناسییەوە و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: ئەوە عەمرۆ کوڕی ئومەییەیە. خەڵکانی مەککە لێمان کۆبوونەوە و وتیان: جگە بۆ زیانگەیاندن نەهاتووە. ئەو لەرۆژگاری جاهلی پیاوکوژێکی چالاك و دێوئاسا بوو. بەهاورێکەم وت: ڕابکە! ئەمە بوو لێی دەترسام. ئیتر دەستمان بەئەبوسوفیان ناگات. خۆت ڕزگار بکە. هاتینەدەر و ڕامان دەکرد تا گەشتینە سەر چیاکە و ڕۆشتینە ناو ئەشکەوتێك و شەومان کردە ڕۆژ و چاوەڕوان بووین ئەوانەی

بەدواماندا دەگەڕێن، بێزار بن. دەڵێت: سوێند بەخوا لەناو ئەشکەوتەکەدا بووم کەعوسمان کوڕی مالکی تەیمی بەسواری ئەسپ هات و بەردەوام سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد. ئەو لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا وەستا. ڕۆشتمەدەر و خەنجەرم لەقوڕگی چەقاند و ئەو هاواری کرد بەشێوەیەك هەموو خەڵکانی مەککە بیستیان. ئەوان ڕوویانکردە شوێنەکەی ئێمە و من گەڕامەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکە. ئەویان بەنیوە گیان دۆزییەوە و وتیان: کێ لەتۆیدا؟ وتی: عەمرۆ کوڕی ئومەییە. لەم کاتەدا مرد و نەیتوانی ئەوان لەشوێنەکەم ئاگادار بکاتەوە. کوژرانی هاورێکەیان ئەوانی لەگەڕان و دۆزینەوەی من دوورخستەوە. ئەوان ئەویان هەڵگرت و بردیان و من دو ڕۆژ لەئەشکەوتەکەدا مامەوە تا ئارامیان گرت. دواتر بەرەو تەنعیم بەرێکەوتم و دارەکەی خەبیب و پاسەوانەکانیم دەبینی. ڕۆشتمە سەردارەکە و ئەوم خستە سەر پشتی خۆم. زیاتر لەچل هەنگاو نەڕۆشتبووم کە لەهاتنی من ئاگادار بوونەوە و شوێنم کەوتن. ئەوم دانا و ئەوان بەخێرایی بەدوامدا دەهاتن. ڕێگەم بەپەلە دەبڕی و وئەوان هیلاك بوون و گەڕانەوە. هاورێکەم بەرێکەوت و سواری وشترەکەی بوو و ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئاگاداری کردەوە. بەڵام خەبیب ئیتر دوای ئەوە نەبینرا. دەڵێی زەوی دەمی کردبوویەوە و قوتیدابوو.

دەڵێت: بەرێکەوتم تا لەزەجنان ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتێك، تیروکەوانم پێبوو. کاتێك لەناو ئەشکەوتەکەدا بووم، بینیم پیاوێکی درێژ و یەك چاو لەمناڵەکانی دۆئەل کەمەری دەلەوەڕاند، هاتەناو. پرسی: کێیت؟ وتم: لەمناڵەکانی دۆئەل. ئەولای من ئارامی گرت و دەنگی لێ هەڵبڕی و دەیخوێند:

و لست بمسلم مادمت حیا    و لست ادین دین المسلمینا

واتاکەی: تازیندووم هیچ کات موسوڵمان نابم و ناچمە سەر ئایینی موسوڵمانان.

دواتر خەوت. کوشتم و بەرێکەوتم کە لەناکاو دووپیاوم بینی کەقورەیشییەکان بۆ شوێن هەڵگرتن و ئاگادار بوون لەژیانی پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانەیان کردبوو. یەکیانم بەتیر کوشت و یەکیانم بەئەسری گرت و بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕامەوە و ئاگادارم کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی و لەخوا بۆ من پاڕایەوە.

لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەمەزان / فەوریەی ٦٢٦ زایینی پێغەمبەر(د.خ) دایکی

هەژاران زێنەب کچی خوزیمەی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. ئەو لەمناڵەکانی هیلال بوو. پێشتر ژنی توفەیل کوڕی حارس بوو کەوازی لێ هێنابوو.

لەم ساڵەدا کاروباری حەج کردن لەدەست بتپەرستەکاندا بوو.

## داستانی بئر مەعونە

لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر/ ژوئیەی٦٢٥ زایینی دەستەیەك لەموسڵمانان لە بئرمەعونە کوژران.

هۆکارەکەی بەوشێوە بوو کەباوکی بەرۆ کوڕی عازەب کوڕی عامر کوڕی مالك کوڕی جەعفەر ناسراو بەفێڵباز، گەورە و سەروەری مناڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە هاتەمەدینە ودیارییەکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هێنا. پێغەمبەر(د.خ) دیارییەکەی وەرنەگرت و وتی: ئەی باوکی بەرۆ من دیاری لەبتپەرەست وەرناگرم. دواتر پێغەمبەر(د.خ) بۆ باوەڕهێنان هانیدا. ئەو خۆی دوورنەخستەوە و باوڕی نەهێنا و وتی: ئایینەکەی تۆ باشە. باشترە یەکێك لە پیاوەکانت بۆ لای خەڵکی نەجد بنێریت تا ئەوان بۆ باوەڕهێنان رێنوێنی بکات چوونکە هیوادارم باوەڕ بێنن. پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەخەڵکی نەجد بۆ سەر گیانی ئەوان دەترسم. باوکی بەرۆ وتی: من پاسەوانی کردنی ئەوان دەگرمە ئەستۆ.

پێغەمبەر(د.خ) حەفتا پیاوی نارد و لەوان: مونزەر کوڕی عەمرۆ ئەنساری، حارس کوڕی سەممە، حەرام کوڕی میلحان، عامر کوڕی فوهەیرە و کەسانیتر. دەستەیەك دەڵێن: چل کەس بوون. ئەوان ڕۆشتن تا لەبئر مەعونە لەنێوان سەرزەمینی مناڵەکانی عامر و دەشتی بەردەڵانی مناڵەکانی سولەیم دابەزین. کاتێك لەوێ مانەوە، نامەی پێغەمبەریان بۆ لای عامر کوڕی توفەیل نارد. ئەو نامەکەی نەخوێندەوە و دەستی ستەمی بۆ سەر حەرام کوڕی میلحان درێژ کرد و کوشتی. کاتێ لێیدا، حەرام وتی: خوا گەورەیە، سوێند بەخوای کەعبە رزگارم بوو. ئەو داوای هاوکاری لەمناڵەکانی عامر کرد بەڵام وەڵامیان نەدایەوە و وتیان: پەیمانی ئەبوبەرۆ ناشکێنین کە ئەو پەنای بەموسوڵمانانیدا. دواتر ئەو لەمناڵەکانی سەلیم

یـــانی: عوســـەییە، ریعـــل و زەکـــوان داوای هاوکـــاری کـــرد کـــەهاتن و دەوری موسڵمانەکانیان گرت و شەڕیان لەگەڵ کردن تا هەموویان کوژران جگە لەکەعب کوڕی زەیدی ئەنساری کەبەنیوە گیان بەرەڵایان کرد و ئەو زیندوو مایەوە تا ئەوەی لەشەڕی خەندەق کوژرا.

لـەناو ئاژەڵـداران وشـوانەکانی ئـەم خەڵکـە، عـەمرۆ کـوڕی ئومەییـە و پیاوێـك لەئەنـسار بـوون. ئـەوان لاشـخۆرەکانیان بـینی بەسـەر شـوێنی گۆڕەپـانی شـەڕەوە هەڵـدەفڕن. وتیـان: شـتێك دژوار ڕوویـداوە. هـەردووك ڕوویـان کـردە گۆڕەپـان و سـەیریان کـرد و لـەناکاو موسـوڵمانانیان بـەکوژراو بـینی و بینیـان سـوارەکان بەدەوریانەوە وەستاون. عەمرۆ کوڕی ئومەییە وتـی: دەڕۆینـە لای پێغەمبـەر(د.خ) و ئاگاداری دەکەینەوە. ئەنساری وتی: من پشت ناکەمەوە ئەو گۆڕەپانەی کەمونزەر کوڕی عەمرۆ تیایدا کوژراوە. ئەو شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و کوژرا. ئەوان عـەمرۆ کوڕی ئومەییان بەئەسیری گرت.

کاتێك عامر کوڕی توفەیل زانی ئەو لەمناڵەکانی سەعدە، ئازادی کرد. عەمرۆ هات تا گەشتە قەرقەرە و دو پیاو لەمناڵەکانی عامری بینی کەهاتنە لای ئەو و لای پێغەمبـەر(د.خ)ەوە پـەیمانێکیان پێبـوو کەعـەمرۆ لێـی ئاگـادار نـەبوو و لەبـەر ئەمـە هـەردووکیانی کوشـت. دواتـر هـەواڵی کوشـتنی ئـەو دووانـەی بەپێغەمبـەردا. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەو دووپیاوەی کوشتت، بیٚ گومان خوێنباییەکەیان دەدەم. دواتر پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەمە کاری ئەبوبەرائە . ئەم کارە بۆ پێغەمبـەر(د.خ) زۆر گران بوو.

لـەناو کوژراوەکـان عـامر کـوڕی فوهـەیرە دەبینـرا. عـامر کـوڕی توفـەیل بـەردەوام دەیپرسی: ئەوە کام کەس لەوان بوو کاتێك کوژرا، ئەویان لەنێوان ئاسمان و زەمین بەرز کردەوە؟ پێیان وت: عامر کوڕی فوهەیرە. حسان کوڕی سابت ئەم شێعرانەی وت و مناڵەکانی باوکی بەرائ ی دژی عامر کوڕی توفەیل هاندا:

| | |
|---|---|
| بني ام البنين الم يرعكم | و انتم من ذوائب اهل نجد |
| تهكم عامر بابي براء | ليخفره و ما خطا كعمد |

واتاکەی: ئەی منالـانی دایکی پیرۆزپیێ، ئایا ئەم کارە ئێوەی رانەچڵەکاند ( و ئێـوە پاسـەوانانی داد و راسـتی لـەناو خـەڵکی نەجـدن) کـەعامر کـوڕی توفـەیل بەباوکی بەرائ پێکەنی و ناتوانین هەڵە بەکارێك کەپێشتر بیر لێکراوەتـەوە وەك یـەك لەقەڵەم بدەین.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی دیکەیشی هەیە. کەعب کوڕی مالك وتی:

لقد طارت شعاعا کل وجه                    خفارة ما اجار ابو براء

واتاکەی: شکاندنی پەیمانی باوکی بەرائ وەك تیشك بۆ هـەر لایـەك بلاو بوویـەوە کەئەو پاسەوانی ئەوانی نەکرد و عامر کوڕی توفەیل بەناپیاوانە کوشتی.

کاتێـك هـەواڵی ئـەم کـارە بەرەبیعـە کـوڕی بـاوکی بـەرائ گەشـت، ڕوویکـردە عـامر کوڕی توفەیل و بەشمشێر یا ڕم لێیدا کە لەئەسپەکەی کەوتە خوار و وتـی: ئەگـەر مردم، خوێنم بۆ مامەکەم بێت. دواتـر خـوای گـەورە سـەبارەت بەخـەڵکی بئرمەعونـە ئایەیەکی لەقورئان نارد کەبەمشێوە بوو: پەیام بەخەڵکەکەی ئێمـە بگـەیێنن کەئێمـە چاومان بەخواوەند کەوت و ئەو لەئێمە رازییە و ئێمە لەو رازی.

دواتر ئەم ئایە لەقورئان دا نەما.

## دەرکردنی منالەکانی نەزیر

هۆکاریەکـەی بەشـێوەیەك بـوو کـەعامر کـوڕی توفـەیل پـەیك و پـەیامی بـۆ لای پێغەمبـەر(د.خ) نـارد و داوای خوێنبـایی ئـەو دوی عامرەیـەی کـرد کەپێشتر عـەمرۆ کوڕی ئومەییە ئەوانی کوشتبوو.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتەدەر و هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك لـە هـاوەڵانی خـۆی و لـەناو ئـەوان ئەبوبـەکر و عومـەر و عـەلی ڕۆشـتە لای منالـەکانی نـەزیر و داوای هاوکـاری لێکردن. وتیان: بەڵێ، هاوکاری تۆ دەکەین لەسـەر داواکـەت. ئـەوان بـەنهێنی لەگـەڵ یەك کۆبوونەوە و بۆ کوشتنی ئەو پلانیان داڕشت و هاودەست بوون. لای دیوارێـك دانیشتبوو. وتیـان: چ کەسێك دەڕواتـە سـەرەوەی ئـەم ماڵـە و تاشـە بەردێك بەسـەر ئـەودا دەخاتـە خـوار و ئێمـە لەدەسـت ئـەو ئاسـودە دەکـات. عـەمرۆ کـوڕی جـەحاش خـۆی بـەئامادە نیشـاندا تـا ئـەم کـارە بەئـەنجام بگـەیێنێت. سـەلام کـوڕی میشـکەم

ڕێگەی ئەم خراپەکارییەی لێگرتن و وتی: ئەو نهێنی ئێوە دەزانێت. بەقسەکانی ئەو رازی نەبوون و عەمرۆ کوڕی جەحاش ڕۆشتە سەر بانەکە. هەواڵ لەئاسمانەوە بۆ پێغەمبەری خوا گەیشت کە ئەوان بۆ چ کارێك هاودەست بوون. پێغەمبەر(د.خ) هەستا و بەهاوەڵانی خۆی وت: لێرە هەڵمەستن تا بێمە لای ئێوە. ئەو هەستا و بۆ مەدینە گەڕایەوە. کاتێك درەنگی کرد، هاورێکانی بەدوایدا گەڕان. ئەو، ئەوانی ئاگادار کردەوە و فەرمانی بەموسوڵمانانیدا بۆ شەڕ ئامادەبن. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و گەمارۆی ئەوانیدا. ئەوان لەبەرابەر ئەو لەناو بورج و قەڵا وماڵەکانی خۆیان سەنگەریان بەست. ئەو دارخورماکانی بڕی و سوتاندی. لەم لاوە، عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی و داروەدەستەکەی پەیامیان بۆ ناردن کەخۆڕاگر بن و پارێزگاری لەخۆتان بکەن، ئێمە بەجێتان ناهێڵین و ئەگەر شەڕ بکەن، لەگەڵ ئێوە شەڕ دەکەین و ئەگەر بڕۆنەدەر، لەگەڵ ئێوە دەڕۆینە دەر. خواوەند ترسی خستە دڵی ئەوانەوە و ئەوان داوایان لەپێغەمبەر(د.خ) کرد دەریان بکات و لەخوێنیان خۆش بێت لەسەر ئەو بنەماییەی لەسامانەکەیان، ئەوەی وشترەکانیان بتوانن باری بکەن، (جگە لەکەڵ و پەلی شەڕ) لەگەڵ خۆیان ببەن. پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو. ئەوان بەرەو خەیبەر ڕۆشتنەدەر و هەندێك لەوان بەرەو شام ڕۆشتن (تا لەوێوە ڕوو بکەنە فەلەستین) ئەوانەی ڕوویان لەخەیبەر کردبوو، کەنانە کوڕی ڕەبیع و حەیی کوڕی ئەختەب بوون. لەم کاتەدا دایکی عەمرۆ، خۆشەویست و دڵداری عوروە کوڕی وەرد (کەژنێکی غەفاری بوو و ئەوی لەو بەزۆر و فێڵ کریبوو) لەناو ئەواندا دەژیا.

سامانەکانی منداڵەکانی نەزیر هەمووی تایبەت بوون بەپێغەمبەر(د.خ) کەچۆن دەیەوێت بەکاری ببات. پێغەمبەر(د.خ) ئەم سامانەی لەناو یەکەم دەستەی موهاجیرەکان دابەش کرد و بەئەنسار هیچی نەدا مەگەر سەهل کوڕی حونەیف و ئەبودوجانە کەئاماژەیان بەهەژاری خۆیاندا و پێغەمبەر(د.خ) لەو سامانە بەوانی بەخشی. لەمنداڵەکانی نەزیر جگە لەدووکەس رزگاری نەبوو: یامین کوڕی عومەیر کوڕی کەعب کوڕە مامی عەمرۆ کوڕی جحاش و باوکی سەعید کوڕی وەهب. ئەم دووانە سامانەکانی خۆیان پاراست.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ویستی بۆ شەڕی منداڵەکانی نەزیر بڕواتەدەر، عەبدوڵڵە

کوڕی دایکی مەکتومی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دیاری کرد. ئالآکەی لەدەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا بوو.

## شەڕی زات الرقاع

پێغەمبەر(د.خ) دوای شەڕی منالەکانی نەزیر، دوومانگی بەهاری لەمەدینە بەسەر برد. دواتر بەرەو نەجد بەرێکەوت و ئاهەنگی شەڕی منالەکانی موحارب و منالەکانی سەعلەبەی لەغەتەفان کرد. ڕۆشت و لەباخێکی دارخورما وچانی گرت. ئەم شەڕە بە زات ئەلرقاع ناودەبەن چوونکە شەڕ لەکێوێکی ڕەش و سپی و سور ڕوویدا. ئەو عوسمان کوڕی عەففانی کردە جێگری خۆی لەمەدینە و ڕووبەڕووی بتپەرستەکان بوویەوە بەلآم شەڕی نەکرد. خەڵك لەیەکتر ترسان و لەبەر ئەمە فەرمانی خوێندنی نوێژی ترس هاتەخوار. مێژوونوسان سەبارەت بەنوێژی ترس بەجیاوازی قسەیان کردووە. ئەمەیان لەنوسراوە فیقهیەکان گێڕاوەتەوە.

پیاوێك لەمنالەکانی موحارب ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای شمشێرەکەی کرد تا لێی بروانێت. شمشێرەکەی بەو پیاوەدا. کاتێك شمشێرەکەی وەرگرت، ڕایوەشاند و وتی: ئەی محەممەد، ئایا لەمن ناترسیت؟ وتی: نە. وتی: بەم شمشێرە کەلەدەستمایە، لەمن ناترسیت؟ وتی: نە، خوا من لەدەست تۆ دەپارێزێت. ئەو پیاوە شمشێرەکەی بۆ گەڕاندەوە.

موسوڵمانەکان ژنێکیان لەوان گرت (و دەستدرێژیان کردە سەر) کەمێردەکەی لەدەرەوە بوو. کاتێك بۆ لای ژنەکەی گەڕایەوە، بۆی باس کرد. ئەو سوێندی خوارد دانەنیشێت تاخوێنی هاوەلآنی پێغەمبەر(د.خ) بڕێژێت. پیاو هاتەدەر و شوێن پێغەمبەر(د.خ) کەوت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەمشەو چ کەسێك پاسەوانی ئێمە دەکات؟ پیاوێك لەموهاجیرەکان و پیاوێك لەئەنسار ئامادەیی خۆیان نیشاندا و لەسەر لێواری دۆڵێك کەپێغەمبەر(د.خ) تیایدا وەچانی گرتبوو، بۆ پاسەوانی کردن وەستان. پیاوە موهاجرییەکە لەسەرەتای شەو خەوت و ئەنساری پاسەوانی دەدا و کاتێك ماوەیەك تێپەڕی، بۆ نوێژ وەستا. هاوسەری ئەو ژنە هات و مۆتەکەی پیاوی ئەنساری بینی و زانی لەپێشەنگەکانی موسوڵمانانە. تیرێکی هاویشت کەلەسەر

جەستەی پیاوی ئەنساری چەقی. ئەو تیرەکەی دەرکێشا و درێژەی بەنوێژەکەیدا. دوبارە تیرێکیتری هاویشت کەبەریکەوت بەلاّم ئەوی لەپێ نەخست. تیری سێیەمی هاویشت، دەریکێشا و سجود و رکوعی خۆی کرد و کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا. ئەوسا هاورێکەی خۆی لەخەو هەستاند و ئاگاداری کردەوە. کاتێك پیاوی موهاجیر جەستەی لەت لەتی پیاوی ئەنساری بینی، وتی: پەنا بۆ خوای گەورە! بۆ کاتێك یەکەم تیرت بەرکەوت ئاگادارت نەکردەوە؟ ئەنساری وتی: سورەیەك لەقورئانی پیرۆزم دەخوێندەوە و نەمدەویست بیبڕم. کاتێك یەك لەدوای یەك تیری بۆمن دەهاویشت تۆم لەخەو هەستاند. سوێند بەخوا ئەگەر ترسی ئەوە نەبوایە ئەو دۆڵە وێران ببێت کەپێغەمبەر(د.خ) منی بۆ پاسەوانی کردنی داناوە، شادەمارەکانم دەبڕا پێش ئەوەی نوێژەکەم تەواو بکەم.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم شەڕە لەموحەڕەمی ساڵی پێنجەمی کۆچی / ژوئەنی ٦٢٦ زایینی ڕوویدا.

## شەڕی دووەمی بەدر

ئەم شەڕەیان بەشەڕی (سویق) ((شەڕی ئارد)) ناو بردوە.

لەشەعبانی ئەم ساڵە/ژانویەی٦٢٦ زایینی پێغەمبەر(د.خ) بەرەو بەدر ڕۆشتەدەر تا خۆی بگەیێنێتە ئەو شوێنەی ئەبوسوفیان دیاری کردبوو( کەوتبووی شوێنی ڕووبەڕووبوونەوەی ئێمە ساڵی داهاتوو لەم شوێنەدا). ئەو لەبەدر دابەزی و هەشت شەو لەوێ مایەوە و چاوەڕوانی هاتنی ئەبوسوفیانی دەکرد. ئەبوسوفیان لەگەڵ خەڵکی مەککە هاتەدەر و تا (مر الظهران) یا( عوسفان) بەرەو پێش ڕۆشت.. خەڵکانی مەککە ئەم سوپایەیان بەسوپای ئارد ناوبرد و وتیان: ڕۆشتنەدەر تا ئاشی ئارد نۆش بکەن.

پێغەمبەر(د.خ) عەبدوللە کوڕی ڕەواحەی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دایکی سەلەمە پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەزەید کوڕی سابتدا خۆی فێری نوسراوە یەهودییەکان بکات.

لەجەمادی ئەلئەوەلی ئەم ساڵە/ئۆکتۆبەری ٦٢٥ زایینی عەبدوڵڵە کوڕی عوسمان کوڕی عەففان کەدایکی روقیە کچی پێغەمبەری خوابوو، کۆچی دوایی کرد. تەمەنی ئەو شەش ساڵ بوو. پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەسەر خوێند. بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا (لە سێیەمی شەعبان/ هەشتی ژانویە٦٢٦ زایینی) حسەین کوڕی عەلی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

بتپەرستەکان ئایینی حەجیان لەم ساڵەدا ئەنجامدا.

## ڕووداوکانی ساڵی پێنجەمی کۆچی ( ٦٢٦—٦٢٧ زایینی )

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ زێنەب کچی جەحش (کچە مامی خۆی) پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست. ئەو ئەم ژنەی کردبووە هاوسەری کۆیلەکەی خۆی زەید کوڕی حارسە ناسراو بەناوی زەید کوڕی محەممەد. ڕۆژێک پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ماڵی زڕکوڕەکەی خۆی زەید و لەبەردەرگای ماڵەکەدا، پەردەیەکی لەموو بینی، با پەردەکەی حەوادا و پێغەمبەر(د.خ) زێنەبی بەڕووتی بینی و حەزی لێکرد و زەید لێی بێزاربوو. ئەو ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئاگاداری کردەوە کە لەژنە نازەنینەکە بێزار بووە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئایا لەو سەبارەت بەشتێك گومانت پەیا کردووە؟ زەید وتی: سوێند بەخوا نە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ژنەکەت بۆ خۆت هەڵبگرە و لەخوا بترسە (ئەحزاب ٣٧/٣٣). زەید ڕۆشت و ژنەکەی لای ئەو مایەوە تا بۆ پێغەمبەر(د.خ) حەلاڵ بوو. خوا وەحی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد. ئەو وتی: کێ مۆژدە بەزێنەب دەدات کەخوا ئەوی وەك هاوسەری من هەڵبژاردووە؟ دواتر ئەم ئایەی خوێند: بیربێنەرەوە ئەو کەسەی خوا بەخشینەکانی پێ بەخشیوە و تۆ بەوت دەبەخشی، دەتوت( ژنەکەت لای خۆت رابگرە و لەخوا بترسە). تۆ لەدڵدا شتێك دەشاردەوە کەخوا ئاشکراکەریەتی. تۆ لەخەڵکان دەترسایت و خوا شیاوترە لێی بترسیت. کاتێك زەید بێزاری لێ دەربری، ئەومان وەك هاوسەری تۆ دیاری کرد تا باوەڕداران لەژنی زڕکوڕەکانیان دوای ئەوەی چێژی خۆیان لەم ژنانە وەرگرت، کێشەیان لەبەردەما نەبێت. و فەرمانی خوا کارێك ئەنجامدانی پێویست( ئەحزاب ٣٧/٣٣). لەوەبەدوا زێنەب لای ژنانی دیکەی پێغەمبەر(د.خ) شانازی بەخۆیەوە دەکرد و دەیوت: ئێوە بەدەستی کەسەکانتان مارە بڕاون و من خوا لەئاسمان مارەی بڕیوم.

لەم ساڵەدا لەرەبیع ئەلئەوەلی/ئەوتی ٦٢٦ زایینی پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی دومە الجندل ڕۆشتەدەر. هۆکارەکەی ئەوە بوو پێغەمبەریان ئاگادار کردەوە کەلەم سەرزەمینە بتپەرستەکان دەژین. پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی ئەوان ڕۆشتەدەر بەلام

شەڕ ڕوویندا. موسوڵمانەکان وشتر و مەڕومالآتی ئەوانیان بەتالآنی گرت.

پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ سەعد کوڕی عوبادە لەم شەڕەدا بوو کەدایکی سەعد مرد. هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ عویەینەت کوڕی حیسنی فەزاری پەیمانی ئاشتی مۆر کرد تا لەتەغلەمین و دەوروبەری ئاژەڵەکانی بلەوڕێنێت .

## شەڕی خەندەق ( هەمان شەڕی ئەحزابە ).

ئەم شەڕە لەشەوالی ئەم ساڵە/فەوریە – مارسی ٦٢٧ زایینی ڕوویدا. هۆکارەکەی ئەوەبوو دەستەیەك لەجوولەکەکانی منالەکانی نەزیر و لەناو ئەوان: عەبدوڵە کوڕی سەلام کوڕی ئەبی حەقیق، حویەیی کوڕی ئەختەب، کەنانە کوڕی رەبیع کوڕی ئەبی حەقیق و کەسانیتر، چەندین دەستەی شەڕکەر و خەڵکی جۆراوجۆریان بۆ شەڕ کردن دژی پێغەمبەر(د.خ) ڕاپەراند. ئەوان ڕۆشتنە لای قورەیشییەکان لەمەککە و وتیان: ئێمە لەگەڵتانین تا بەتەواوی لەناویان ببەین. قورەیشییەکان رازی بوون. دواتر ڕۆشتنە لای منالەکانی غەتەفان و داوایان کرد شەڕی پێغەمبەر(د.خ) بکەن. غەتەفانییەکان رازی بوون. قورەیشییەکان بەسەرکردایەتی عویەیینە کوڕی حیسن لەگەڵ منالەکانی فەزارە و حارس کوڕی عەوف کوڕی ئەبی حارسەی موڕی لەگەڵ منالەکانی مورە و مێسعەر کوڕی روخەیلەی ئەشجەعی لەگەڵ منالەکانی ئەشجەع هاتنەدەر.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، فەرمانیدا موسوڵمانەکان لەدەوری مەدینە چاڵێك هەڵکەنن و سەنگەر لێبدەن. ئەمە بیرۆکەیە سەلمانی فارسی بوو و بەپێغەمبەری وت و ئەمە یەکەم شەڕ بوو خۆی تیایدا شان بەشانی پێغەمبەر(د.خ) بەشداری کرد. لەم ڕۆژەدا ئازاد بوو. پێغەمبەر(د.خ) بۆ وەرگرتنی پاداشتی خوایی و بزواندنی موسوڵمانان بۆ ئەم کارە، لەهەڵکەندنی خەندەق بەشداری کرد. دەستەیەك لە دووڕووەکان، ئارام و بێ ئاگاداری پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتنەدەر. خوا لەمبارەوە ئەم ئایەی ناردەخوار: داواکەی پێغەمبەر(د.خ) بەشێوەیەك لێکمەدەنەوە کەهەندێك لەئێوە داوای کارێك لەدەستەیەکیتر دەکەن. بێ گومان خوا لەناو ئێوە ئەو کەسانە دەناسێت، بۆ خۆدزینەوە لەشەڕ ئارام و بێدەنگ، خۆیان

دوردەخەنەوە. دەبێت ئەو کەسانەی گوێرایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) ناکەن ئاگادار بن کەگیرۆدەیە ئاژاوەیەك یا ئەشکەنجەیەك دەبن (نور /٦٣/٢٤). پیاوە موسوڵمانەکان بەشێوەیەك کاریان دەکرد، ئەگەر پێشهاتێك بۆیان روویبدایە یان نیازیان بەشتێك هەبوایە، ناچار بوون فەرمان لەپێغەمبەر(د.خ) وەربگرن. هەرکەس دەرۆشت، کاری خۆی دەکرد و دواتر دەگەڕایەوە و دەستی بەهەڵکەندنی خەندەکەکە دەکردەوە. دواتر خوا ئەم ئایەی نارد: باوەڕداران، ئەو کەسانەن باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەر(د.خ)ەکەی هەیە و هەرکات بۆ کارێك کۆببنەوە، هیچ کات ناڕۆن مەگەر ئەوەی فەرمانی لێوەربگرن. ئەوان داوای فەرمان لەتۆدەکەن، ئەو کەسانەن، کەباوەڕیان بەخوا و نێردراوەکەی هەیە. کەواتە ئەگەر بۆ هەندێك لەکارەکانی خۆیان داوای فەرمانیان لەتۆ کرد، هەر کەس دەتەوێت فەرمانی پێبدە و داوای لێخۆش بوونی بۆ بکە کەخواوەند بەخشەر و میهرەبانە(نور/٦٢/٢٤)

پێغەمبەر(د.خ) شوێنی خەندەکەکەی لەناو موسڵماناندا دابەش کرد. لەم کاتەدا لەنێوان موهاجیران و ئەنسار سەبارەت بەسەلمانی فارسی کێشە دروست بوو و هەرکام دەیانەوت ئەو لەئێمەیە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: سەلمان لەئێمەیە، سەلمان لەبنەماڵەی ئێمەیە. ئەو بە هەردەکەس، فەرمانی هەڵکەندنی چل گەز خەندەکیدا. سەلمان، حوزەیفە، نوعمان کوڕی موقرەن، عەمرۆ کوڕی عەوف و شەش لەئەنسار پێکەوە کاریان دەکرد. لەم کاتەدا تاشەبەردێکی گەورە دەرکەوت و پاچەکانی شکاند. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ سەلمان ڕۆشتە ئەوێ و بەشێوەیەك لەتاشەبەردەکەیدا، ورد و خاش و هەورەبروسەکەیەك لێی هاتەدەر کەدەشتی مەدینەی رووناك کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: (خوا گەورەیە). موسوڵمانەکان وتیان: خوا گەورەیە. تاشەبەرد دووجاریتر بەلێدانی پێغەمبەر(د.خ) هەورەبروسکە و روناکی بەخشی و دواتر ورد و بوو بەخۆڵەمێش و هەرجارەو موسڵمانان و پێغەمبەر(د.خ) هاواریان دەکرد: خوا گەورەیە. سەلمان لێی پرسی لەو تیشك و روناکییەدا چی بینیوە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەیەکەم هەورەبروسکە حیرە و کۆشکەکانی خوسرەو بۆمن دەرکەوت و جبرەئیل ئاگاداری کردمەوە ئۆمەتەکەی من بەسەر ئەو شوێنەدا زاڵ دەبن. لەدووەم هەورەبروسکە کۆشکەکانی سوری

سەرزەمینی شام و ڕۆم دەرکەوتن و ئەو منی ئاگادار کردەوە ئۆمەتەکەم بەسەر ئەو سەرزەمینەدا زاڵ دەبن. لەسێیەم ڕووناکی، کۆشکەکانی سەنعا هاتنە بەرچاوی من و منی ئاگادار کردەوە، ئۆمەتەکەم بەسەر ئەوێشدا زاڵ دەبن.

دووڕووەکان وتیان: ئایا سەرتان سوڕنامێنێت؟ مژدەی فێرۆ بەئێوە دەدات و دەڵێت لەیەسربەوە، حیرە و شارەکانی خوسرەوەکانی بینیوە کەئێوە بەسەریاندا زاڵ دەبن لەگەڵ ئەوەی ئێستاکە ناتوانن سەر بەرز بکەنەوە. خوا ئەم ئایەی نارد: کاتێك دوەڕووەکان و دڵنەخۆشەکان دەیانوت: خواوەند و نێردراوەکەی جگە لەفێڵ، مژدەیەکیان بەئێمە نەدا (احزاب/٢٣/١٢).

قوڕەیشییەکان گەشتن تا لەشوێنی کۆبوونەوەی لافاوەکان لە(ڕۆمە) لەنێوان (جۆرف) داوێنی خلیسك و تەختی کێو) و زەغابە دابەزین. ژمارەی ئەوان بەهاوپەیمانەکانیان و شوێنکەوتوانیان لەکەنانە و تەهامە نزیکەی دەهەزار کەس بوو. غەتەفانییەکان و شوێنکەوتووەکانیان هاتن و لای کوێستانی ئۆحۆد نیشتەجێ بوون. پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان، بەسێ هەزار پیاوی شەڕکەر گەشتن و پشت بەدرزی چیای ئۆحۆد جێگیر بوون. ئەو لەوێ دابەزی و ژنان و منالانی بردەسەر و لەقەلا بەردینە بەهێزەکان جێگیری کردن. حەیی کوڕی ئەختەب ڕۆشتەدەر تاگەشتە لای کەعب کوڕی ئەسەد سەروەری قورەیزە. ئەو لەسەر بنەمای تەندروست مانەوەی خەڵکەکەی، لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی ئاشتی بەستبوو. کەعب دەروازەی قەلاکانی خۆی بەهێز کردبوو و مۆڵەتی بەحەیی کوڕی ئەختەب نەدا بڕواتە ناو ماڵەکەی. پێی وت: تۆ پیاوێکی شومیت. من پەیمانم لەگەڵ محەممەد بەستووە و جگە لەپێبەند بوون بەنەخۆشییەکەی هیچم لێ نەدیوە. حەیی وتی: ئەی کەعب، من سەروەری و بەرێزی ڕۆژگاران هاوڕێ لەگەڵ دەریاییەکی خرۆشاو و لێوانلێو لەگەوهەرم بۆتۆ بەدیاری هێناوە. من قوڕەیشییەکان و سەروەران و فەرماندەکانی ئەوانم هێناوە و غەتەفانییەکان لەگەڵ گەورەکانیان هاتوون و پەیمانیان بەمنداوە لێرە ناڕۆن تا محەممەد و هاوەڵانی بەتەواوی لەناو ببەن. کەعب وتی: ڕسوایی ڕۆژگارانت بەدیاری بۆ هێناوم، هەورێکی وشکت هێناوە کەبارانەکەی باریوە و ئێستا جگە لەهەورەبروسکە هیچی تیا نییە. هاوار

لەتۆ ئەی حەی! من لەگەڵ محەممەد بەجێبێڵە. حەیی بەردەوام دەور و خولی ئەدا و ئەوەندە بردی و هێنای کەهەڵخەڵەتا وناچار بوو بەفێڵ کردن لەپێغەمبەر(د.خ). کەعب ئەو کارەی کرد و پەیمانەکەی شکاند. حەیی سوێندی بۆ خوارد ئەگەر غەتەفانییەکان و قورەیشییەکان بڕۆن و بەسەر محەممەدا زاڵ نەبن، دێمە لای تۆ، تا ئەوەی بەتۆ دەبڕێت بەمنیش ببڕێت. لەم کاتەدا بوو دژواری زۆر و ترس زیادی کرد و دوژمنان لەسەر و خوار هێرشیان کردە سەریان و هەندێ لەدووڕووەکان خۆیان ئاشکرا کرد. پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماوەی بیست و چەند شەو مایەوە و بتپەرستەکان بەسەر سەرییەوە بوون. لەنێوان هەردوولای شەڕکەر جگە لەتیر هیچ شتێك ئاڵ و گۆڕنەدەکرا.

کاتێك بارودۆخ بۆ پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی دژوار بوو، پێغەمبەر(د.خ) پەیك و پەیامی بۆ لای عویەیینە کوڕی حیسن و حارس کوڕی عەوف موڕی فەرماندەکانی غەتەفان نارد و دوو لەسەر سێی میوەکانی مەدینە بەوان بەخشی لەسەر ئەو بنەمایەیی ئەوان و هاورێکانیان شەڕی پێغەمبەر(د.خ) نەکەن و بگەڕێنەوە. ئەوان بەم پێشنیارە ڕازی بوون. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ سەعد کوڕی مەعاز و سەعد کوڕی عبادە ڕاوێژی کرد. ئەو دووانە وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کارێکە دەتەوێت خۆت ئەنجامی بدەیت یا خوا فەرمانی پێ کردوویت یا کارێکە دەتەوێت بۆ ئێمەی ئەنجام بدەیت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: دەمەوێت بۆ ئێوە کارێك بکەم چوونکە بینیم عەرەبەکان بە یەك کەوان ئێوە تیرباران دەکەن و لەبەر ئەمە ویستم شکۆ و هێزی ئەوان تێکبشکێنم. سەعد کوڕی مەعاز وتی: ئەو کاتەی ئەوان و ئێمە هەردووکمان بتپەرەست بووین، نەیاندەتوانی یەك دەنك خورما جگە لەکڕین یا میوانی لەئێمە وەربگرن. ئێستا کەخوا ئێمەی بۆ ئیسلام ڕێنوێنی کردووە، دارایی خۆمان بەوان بسپێرین! جگە لەشمشێر هیچ بەوان نادەین تا خوا لەنێوان ئێمە و ئەوان داوەری بکات. پێغەمبەر(د.خ) ئەو کارەی پشت گوێ خست.

ئەوسا چەندین سوار لەقورەیش و لەوان: عەمرۆ کوڕی عەبدود یەك لەمناڵەکانی عامر کوڕی لۆئەی، عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل، هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهب، نەوفل کوڕی عەبدوڵڵە و زرار کوڕی خەتابی فیهری سوار لەسەر ئەسپەکانی خۆیان لای

منداڵەکانی کەنانە تێپەڕین و وتیان: بۆ شەڕ ئامادە بن تا بزانن پیاوانی شەڕکەر و سوارانی شەڕکەر کێن. عەمرۆ کوڕی عەبدود لەسەر ناباوەڕی لەشەڕی بەدر ئامادە و بەقورسی بریندار بووبوو. ئەو لەشەڕی ئۆحوّد بەشداری نەکرد بەڵام لەشەڕی خەندەق ئالاّ بەدەست هێرشی دەکرد تاهەمووان شوێنەکەی بزانن. خۆی و هاوەڵانی هاتن ولەسەر چاڵەکە وەستان و بەشوێن ڕێگەیەکی تەنگ و تەسکدا گەڕان. ئەسپەکانیان غاریاندا و ئەوانی لەناو چاڵی و دۆڵی چیاکە تێپەڕاند. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و چەند کەس لەموسوڵمانان ڕێگایان لیٚ بەستن. عەمرۆ کوڕی عەبدود ئالاّ بەدەست و دەستار لەسەر هاتبوو. عەلی پێی وت: ئەی عەمرۆ، تۆ پەیمانت داوە هەر کام لەقورەیشییەکان ئەگەر داوای یەك یا دوکار لەتۆبکات، بەیەکیان ڕازی بیت. وتی: بەڵیٚ. عەلی وتی: کەواتە تۆ بۆ سەر ئیسلام و بۆ لای خوا بانگ دەکەم. عەمرۆ وتی: پێویستم پێی نییە. عەلی وتی: کەواتە شەڕی دەستەویەخەم لەگەڵ بکە. عەمرۆ وتی: سوێند بەخوا نامەوێت تۆ بکوژم. عەلی وتی: بەڵام من دەمەوێت تۆ بکوژم. لەم کاتەدا عەمرۆ ڕقی هەستا و خۆی لەئەسپەکەی هەڵدایە خوار و ڕووی لەعەلی کرد. پەلاماری یەکیاندا. عەلی ئەوی دابەزەویدا و کوشتی. ئەسپەکانیان ڕەمیان کرد. هاوریٚ لەگەڵ عەمرۆ دوانیتر کوژران کە یەکیان بەدەستی عەلی کوژرا و یەکیتریان بەتیرێك کەبەهۆی برینەکەیەوە لەمەککە مرد.

لەم ناوەدا تیرێك بەر سەعد کوڕی مەعاز کەوت کە (شادەماری گیانی) ئەوی بڕی. حبان کوڕی قەیس کوڕی عەرەقە کوڕی عەبدمەناف لەمناڵەکانی مەعیس لەعامر کوڕی لۆئەی تیرەکەی بۆ هاویشت. عەرەقە (ژنێکی عارەق بۆنخۆش) ناوی بەناوبانگی دایکی ئەو بوو. بۆیە بەم ناوە بانگیان دەکرد چوونکە عارەقەکانی بۆنێکی زۆرخۆشیان هەبوو. ناوی قیلابە کچی سەعد کوڕی سەهمە.ئەو دایکی عەبدمەناف کوڕی حارسە. کاتێك ئەو پیاوە تیری بۆ سەعد کوڕی مەعاز هاویشت، وتی: بیگرە کەمن کوڕی عەرەقەم. سەعد وتی: خوایە، ئەگەر لەشەڕی قورەیشییەکان هیچ ماوەتەوە، من بۆ ئەوە زیندوو بهێڵەوە، چوونکە خۆشەویستترین کار لای من شەڕ کردن لەگەڵ خەڵکێکە کەپێغەمبەرکەی تۆیان

ئازاردا و ئەویان بەدرۆزن ناوبرد. ئەی خوایە، ئەگەر دەتەوێت شەڕی نێوان ئێمە و ئەوان کۆتایی پێبێنیت، بیکە بەسەرەتای گیاندانی من و من مەمرێنە تا چاوەکانم بە لەناوچوونی منداڵەکانی قورەیزە بحەوێتەوە. ئەوان هاوپەیمانەکانی ئەو لەرۆژگاری جاهلی بوون.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی تیری بۆ سەعد کوڕی مەعاز هاویشت، باوکی ئوسامە جوشەمی هاوپەیمانی منداڵەکانی مەخزوم بوو. کاتی سەعد ئەمەی وتی: خوێنەکەی وەستایەوە.

سەفیە پوری پێغەمبەر(د.خ) لە(فارغ) قەڵای حسان کوڕی سابت بوو. حسان لەگەڵ ژنان لەم قەڵایەدا دەژیا چوونکە پیاوێکی ڕسوا و ترسەنۆك بوو. سەفیە دەڵێت: کەسێك لەجوولەکەکان هاتە لای ئێمە. بەحسانم وت: ئەم جوولەکە بەدەوری ئێمەدا دەسوڕێتەوە و من دڵم ئاسودە نابێت کەلێنێك بکەوێتە قەڵاکەی ئێمە و دوژمن ڕێگاکەی بزانێت. بڕۆ و بیکوژە. حسان وتی: من پیاوی ئەم کارە نیم. بەڵێت: ستونی خێوەتێکم هەڵگرت و کێشام بەسەریا و کوشتم. دواتر گەڕامەوە بۆ لای حسان کوڕی سابت و وتم: بڕۆ و کەلوپەلی شەڕەکانی بۆ خۆت هەڵگرە. وتی: پێویستم بەوان نییە.

دواتر نەعیم کوڕی مەسعودی ئەشجەعی ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) من باوەڕم هێناوە بەڵام کەسەکانم لەم کارە ئاگادار نین. هەرچیت دەوێت، فەرمان بدە. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: تۆ یەك پیاو زیاتر نیت. هەرچەند دەتوانی ئەوان لەشەڕ کردن لەگەڵ من دڵسارد بکەرەوە و لەناو ئەوان دووبەرەکی دروست بکە و ئەوان لەهاوکاری کردنی یەکتر دووربخەرەوە چوونکە شەڕ جگە لەفێڵ بەسەرکەوتن کۆتایی نایەت. ئەو هاتەدەر و ڕۆشتە لای منداڵەکانی قورەیزە و پێی وتن: ئێوە لەگەڵ قوڕەیشییەکان و غەتەفانییەکان بۆ شەڕ لەگەڵ محەممەد هاودەست بوون بەڵام ئەوان وەك ئێوە نین. شار شاری ئێوەیە و ژن و منداڵ و سامانەکانی ئێوەی تیایە و ئێوە ناتوانن لەم شارە بۆ شوێنێکی تر بڕۆن. ئەگەر قوڕەیشییەکان و غەتەفانییەکان، دەرفەت یا تالانییەك ببینن، کەڵکی لێوەردەگرن. ئەگەر جگە لەمە بێت، دەگەڕێنەوە بۆ شارەکانی خۆیان و ئێوە و محەممەد بەتەنیا

جێ دێڵن کەئەگەر تەنیا بمێننەوە ناتوانن لەبەرابەر ئەو خۆراگری بکەن. ئێوە شەڕ دەست پێمەکەن تا چەندین کەس لەگەروەکانیان وەك بارمتە بگرن بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دڵ ئاسودەیی ئێوە و بەپشت ئەستوری لەگەڵ محەممەد شەڕ بکەن. وتیان: چاکی و باشی ئێمەت دەوێت.

دواتر هاتەدەر و ڕۆشتە لای قوڕەیشییەکان و بەئەبوسوفیان و هاوڕێکانی وتی: ئێوە لەدۆستایەتی من بۆخۆتان ئاگادارن و دەزانن لەمحەممەد بەدوورم. بیستومە مناڵەکانی قورەیزە لەکرداری خۆیان پەشیمان بوونەوە و بۆ لای محەممەد پەیك و پەیامیان ناردووە کە: ئایا لەئێمە رازی دەبێت ئەگەر چەندین پیاو لەگەورەکانی قورەیش و غەتەفان بگرین و بەتۆی بسپێرین تا بیانکوژێت؟ محەممەد وەڵامی ئەوانی داوەتەوە: بەڵێ. ئەگەر مناڵەکانی قورەیزە داوای بارمتەیان لەپیاوەکانی ئێوە کرد، یەك کەسیشیان تەسلیم مەکەن. دواتر هاتە لای غەتەفانییەکان و وتی: ئێوە کەسان و بنەماڵەکەی منن. ئەو هەمانی بەغەتەفانییەکان وت کەبە قوڕەیشییەکانی وتبوو.

کاتێك شەوی شەممە لەشەوالی ساڵی پێنجەم/فەوریەی –مارسی٦٢٧ زایینی گەشت، دواهاتی کارەکانی پێغەمبەر(د.خ) بووبەوەی کەئەبوسوفیان و گەورەکانی غەتەفان، عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهلیان بۆ لای مناڵەکانی قورەیزە نارد و وتیان: ئێمە لەماڵی خۆمان و شوێنی نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی خۆمان نین و ناتوانین لێرە زۆر چاوەڕێ بکەین. ئەسپ و وشترەکانی ئێمە لەناوچوون. بەرەبەیان بۆ شەڕ لەگەڵ محەممەد ئامادە بن. مناڵەکانی قورەیزە وتیان: ئەمڕۆ شەممەیە و ئێمە هیچ کارێك لەشەممەدا ناکەین، جیاواز لەوە شەڕ ناکەین تا بۆ ئاسودەیی دڵی ئێمە، بارمتە لای ئێمە دابنێن چوونکە لەوە دەترسین بۆ شارەکانی خۆتان بگەڕێنەوە و ئێمە لەگەڵ ئەم پیاوە بەتەنیا جێبێڵن و ئێمە لەشارەکەی ئەودایین. کاتێك نێردراوان ئەم وتەیان گەیاندە قورەیش و غەتەفانییەکان، وتیان: سوێند بەخوا نەعیم کوڕی مەسعود راستی دەوت. ئەوان پەیامیاندا: تەنانەت یەك پیاوە وەك بارمتە لای ئێوە دانانێین. لەم کاتەدا مناڵەکانی قورەیزە وتیان: ئەوەی نەعیم کوڕی مەسعود وتی راست بوو. خوا ئەوانی لەهاوکاری کردنی یەکیتر دوورخستەوە. دواتر خواوەند

لەشەوەکانی ساردی زستان، بایەکی ساردی هەڵکرد کەقازانەکانی ئەوانی سەرەوخوار و خێوەتەکانی ئەوانی هەڵدەکەند.

کاتێك هەواڵی ناسازگاری ئەوان بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت، حوزەیفە کوڕی یەمانی بانگ کرد و وتی: بڕۆ لای ئەوان و سەیری بارودۆخیان بکە و تا نەگەڕاویتەوە بۆ لای ئێمە هیچ کارێك مەکە. حوزەیفە وتی: با و سوپاکەی خوا تەنگی پێهەڵچنیبوون بەشێوەیەك نەقازان لەسەر ئاگر دەما و نەخێوەتێك لەسەر پێ و نەئاگرێگ هەڵگیرساو. ئەبوسوفیان هەستا و وتی: ئەی قوڕەیشییەکان، هەرکەس ئاگای لەوەی تەنیشی خۆی بێت. من دەستی پیاوێك کەلای منەوە دانیشتبوو گرتم و وتم: کێیت؟ وتی: فلاَن. دواتر ئەبوسوفیان وتی: ئەسپ و وشترەکانی ئێمە لەناوچوون و مناڵەکانی قورەیزە لەپەیمانەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و ئەم با ناسازگارە هەڵیکردووە کەخۆتان دەیبینن. کۆچ بکەن چوونکە من کۆچ دەکەم. دواتر بەرەو وشترەکەی خۆی ڕۆشت و سواری بوو و ئەگەر لەبیری پەیمانەکەی پێغەمبەر(د.خ) نەبوومایە، دەمکوشت.

حوزەیفە دەڵێت: بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕامەوە کەلەخێوەتێکی پەشمین لای یەکێك لەهاوسەرەکانی نوێژی دەخوێند. منی بۆ ناو خێوەتەکە بانگ کرد و لێواری خێوەتەکەی پیادام تا سەرمام نەبێت. کاتێك سلاَوی نوێژی دایەوە، لەهەموو شتێك ئاگادارم کردەوە.

غەتەفانییەکان بیستیان کەقورەیشییەکان چییان کردووە. لەبەر ئەمە بەپەلە ڕوویان لەشارەکانی خۆیان کرد. کاتێك گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا وتی: لەمەدوا ئێمە دەڕۆینە شەڕی ئەوان نەك ئەوان بۆ شەڕی ئێمە. بەم شێوەبوو تا خوا کاری گرتنی مەککەی بۆ ئاسان کردن.

## شەڕی منداڵەکانی قورەیزە

کاتێــك پێغەمبــەر(د.خ) شــەوی گەیانــدە بــەیانی، بۆمەدینــە گەڕایــەوە و موسـوڵمانەکان کەلوپـەلی شـەڕیان دانـا، پێغەمبـەر(د.خ) بـۆ سـەعد کـوڕی مـەعاز خێـوەتێکی گومـەزی لـەناو مزگـەوت هـەڵکرد تـا لەنزیکـەوە پەرسـتاری لـێ بکـات. لەکاتی نیمەڕۆدا، جبرەئیل هاتە لای پێغەمبـەر(د.خ) و وتـی: ئایا کەلوپـەلی شەڕت داناوە؟ پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: بـەڵێ. جبرەئیل وتـی: فریشتەکان کەلوپـەلی شـەڕیان دانەناوە. خوا فەرمانت پێ دەدات بەرەو منداڵەکانی قورەیزە بڕۆیت چوونکە منیش دەمـەوێت بـۆ ئـەوێ بـڕۆم. پێغەمبـەر(د.خ) فـەرمانی بەجارچییەکەیدا: هەرکـەس فەرمانبردار و بیسەرە، نوێژەکەی تر(نوێژی عەسر) تـەنیا لەسـەرزەمینی منداڵەکانی قورەزیزە دەتوانێت بخوێنێت. ئەو عەلی بەئاڵاکەی خۆیەوە لەپێشەوە ڕەوانە کرد و خـەڵکان، یـەك لـەدوای یـەك دەڕۆشتن. پێغەمبـەر(د.خ) ڕۆشـت و هەنـدێك لـەپیاوان دوای نوێـژی خـەوتنان پەیوەسـتی ئـەو بـوون و نوێـژی عەسـریان لـەوێ خوێنـد و پێغەمبەر(د.خ) لێیان خۆشبوو.

پێغەمبـەر(د.خ) منداڵـەکانی قورەیزەی بـۆ مـاوەی بیسـت و پێـنج شـەو گـەمارۆدا. کاتێـك گـەمارۆ لەسـەر ئـەوان دژوار بـوو، کەسـیان بـۆ لای پێغەمبــەر(د.خ) نـارد: ئەبولەبابـە کوڕی عەبدوڵڵـە مـونزەر لەئەنساریيەکانی ئـەوس بـۆ لای ئێمـە بنێـرە تـا ڕاوێژی لەگەڵدا بکەین. کاتێك ئەویان بینی، پیاوان بـەرەو لای رایـان کـرد و ژنـان و منالاّن دەستیان بەگریان کرد. ئەو بەزەیی بەواندا هاتەوە. وتیان: گوێ بۆ فـەرمانی پێغەمبـەر(د.خ) بگـرین؟ ئەبولەبابـە وتـی: بـەڵێ. ئـەو بەدەسـتی خـۆی قـوڕگی خـۆی نیـشاندا کەفـەرمانی سـەربڕین لەناودایـە. ئەبولەبابـە وتـی: هـەنگاوەکانم تـەکانیان نـەخوارد تـا زانـیم خیانـەتم لـەخوا و پێغەمبـەر(د.خ) کـردووە( ڕەنگـە لەبـەر ئـەوەی لەخۆوە وتومە: ئێوە سەر دەبڕن). وتم: سوێند بەخوا لەشوێنێك ناوەستم کەتیایـدا نافـەرمانی خـوام کردبێـت. ئـەو یەکراسـت ڕۆشـتە مزگـەوت و خـۆی بەسـتونێکەوە بەسـتەوە و وتـی: لێـرە تـەکان نـاخۆم تـا خـوا مـن ببەخـشێت. خـوا ئـەوی بەخـشی

وپێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردەوە.

دواتر ئەوان گوێرایەڵی فەرمانی پێغەمبەریان کرد. ئەوسییەکان وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ، سەبارەت بەهاورێکانی ئێمە ئەو فەرمانەبدە کەسەبارەت بەهاورێکانی خەزرەج (یانی مناڵەکانی قینقاع) فەرمانتداد. پێشتر ئاماژەمان بەم داستانەدا. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئایا شادمان نین سەعد کوڕی مەعاز لەمبارەوە داوەری بکات؟ وتیان: رازین. خەڵك بۆ لای ئەو هاتن و ئەویان سوار کەرێك کرد و بردیانە لای پێغەمبەر(د.خ) و بەردەوام دەیانوت: ئەی باوکی عەمرۆ، لەگەڵ هاورێکانی ئێمە چاکە بکە. کاتێك زۆریان وت، وتی: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە سەعد لەرێگەی خوادا گرفتاری سەرکۆنەی هیچ سەرکۆنەکەرێك نەبێت. زۆربەی ئەوان زانیان کەئەو فەرمان بەکوشتنی ئەوان دەدات. کاتێك سەعد گەشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، فەرمووی: بۆ گەورەی خۆتان هەستنە سەرپێ. یا وتی: بۆ باشترینتان هەستنە سەرپێ. ئەوان هەستان و ئەویان داگرت و وتیان: ئەی باوکی عەمرۆ، لەگەڵ هاورێکانت دادپەروەربە کەپێغەمبەر(د.خ) داوەری کردنی ئەوانی بەتۆ سپاردووە. سەعد وتی: ئایا سوێند و پەیمانی خوا بەگەردنی ئێوەیە کەداوەری سەبارەت بەوانی بەمن سپاردووە؟ وتیان: بەڵێ. بەرەو لای ئەو شوێنە رۆشت کەپێغەمبەری لێبوو و بۆ رێز گرتن لە پێغەمبەر(د.خ) چاوەکانی بەست و وتی: هەمان سوێند و پەیمان لەسەر گەردنی ئەو کەسانەیە کەلێرەن؟ وتیان: بەڵێ. پێغەمبەریش وتی: بەڵێ. سەعد وتی: کەواتە من فەرمان دەدەم شەرکەران بکوژرێن و ژنان و منالأن بەئەسیری بگیرێن و سامانەکان دابەش بکرێن. پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەپشت حەوت پەردەوە، لەسەر ویستی خوا سەبارەت بەوان داوەریت کرد.

ئەوسا مناڵەکانی قورەیزەیان هێنا و لەماڵی کچی حارس (ژنێك لەمناڵەکانی نەجار) زیندانیان کرد. دواتر پێغەمبەری خوا بەرەو بازاری مەدینە رۆشتەدەر و لەوێ چاڵی هەڵکەند و ئەوانی نارد کەلەوێ سەریان برین. لەناو ئەوان حەیی کوڕی ئەختەب و کەعب کوڕی ئەسەد دەبینران. ئەوان شەشسەد یا حەوسەد یالەنێوان حەوسەد تا نۆسەد کەس بوون. حەیی کوڕی ئەختەبیان بەدەست بەستراوی هێنایە پێش. کاتێك پێغەمبەری بینی، وتی: لەدوژمنی کردنی تۆ خۆم سەرکۆنە ناکەم،

بەڵام ئەو کەسەی دەست لەهاوکاری خوا هەڵگرێت، بێ کەس و کار دەمێنێتەوە. دواتر بەخەڵکی وت: لەفەرمانی خوا ترسم نییە، چارەنوس و داستانێکی هەست بزوێن و نامەیەکە بۆ منداڵەکانی، منداڵەکانی ئیسرائیل نوسراوە. ئەویان دانیشاند و لەملیاندا. لەوان جگە لەیەك ژن نەکوژرا و ئەویش کەسێك بوو کارێکی کردبوو شیاوی کوشتن بێت. هەروەها لەناو ئەوان ئەرفە کچی عارزە کوژرا.

لەناویاندا ئەمانە باوەڕیان هێنا و لەمەرگ رزگاریان بوو. سەعلەبە کوڕی سەعید، ئۆسەیید کوڕی سەعید و ئەسەد کوڕی عوبەید.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) سامانی ئەوانی دابەش کرد. بەسوارەکان سێ بەشیدا، بەئەسپ دووبەش، بەسوارەکەی یەك بەش و بە پیادەی بێ ئەسپ یەك بەش. ئەسپەکان سی و شەش سەر بوون. لەسامانەکە پێنج یەکی لێ دەرکرد. ئەمە یەکەم تالآنی بوو هەم بەشی سوارەی لێدەرکرا هەم بەشی پێغەمبەر(د.خ) . پێغەمبەر(د.خ) بۆخۆی رەیحانە کچی عەمرۆ کوڕی خونافەی لەمنداڵەکانی قورەیزە هەڵبژارد. ویستی بیکاتە هاوسەری خۆی. رەیحانە وتی: من لەناو سامانەکەی خۆت هەڵبگرە کەبۆ هەردووکمان سوکتر و ئارامترە. کاتێك کێشەی منداڵەکانی قورەیزە کۆتایی هات، برینی سەعد کوڕی مەعاز دەمی کردەوە و خوا داواکەی بەجێهێنا. ئەو لەناو خێوەتەکەی خۆی لەمزگەوتا بوو. پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر و عومەر هاتنە سەری. عایشە دەڵێت: گریانی باوکم ئەبوبەکر و هەروەها گریانی عومەرم لەسەر ئەو بیست. بەڵام پێغەمبەر(د.خ) بۆ کەس نەدەگریا. کاتێك بەسەختی خەمبار دەبوو، ریشی خۆی دەگرت.

سەرکەوتن بەسەر منداڵەکانی قورەیزە لەکۆتایی زیقەعدە و کۆتایی ژیانی ئەوان لەسەرەتای زی الحجە/ ٢٢- ٢٣ ئاوریلی ٦٢٧ زایینی بوو. لەموسڵمانان لەشەڕی خەندەق شەش کەس و لەشەڕی منداڵەکانی قورەیزە سێ کەس کوژران.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەشەمی کۆچی ( ٦٢٧-٦٢٨ زایینی )

### شەڕی مناڵەکانی لەحیان

له جمادی ئەلئەوەل ئەم ساڵە(سپتامبەری٦٢٧ زایینی) پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی مناڵــەکانی لــەحیان ڕۆشــتەدەر و شــوێن هاوڕێیــانی ڕەجیــع (خــاوەنی وشــترە هیلاکــەکان) یــانی خوبــەیب کــوڕی عــودەی و هاوڕێکــانی کــەوت. وای نیــشاندا دەیــەوێت بڕواتــە شــام تــا ئــەوان ناکــاوگیر بکــات و لــەناکاو هێــرش بکاتــە ســەریان. بەپەلــە ڕێگــەی بــڕی تــا گەشــتە غــەران یــانی شــوێنی نیــشتەجێبوونی مناڵــەکانی لەحیان کە لەنێوان ئەمەج و عوسفان بوو. بینی ترساون و ڕوویـان لەبەرزاییـەکانی کوێستان کردووە و پـەنایان بۆ ئەویّ بردووە. کاتێك ئـەوەی دەیوییست بەدەستی نـەهێنا لەگـەڵ دووســەد ســوار بەرێکـەوت و بـۆ ترسـاندنی خـەڵکانی مەککـە خـۆی گەیاندە عوسفان. دووان لەسوارەکانی سوپاکەی بەرێکرد تا خۆیان گەیاندە کوراعە ئەلغەمیم. ئەوسا سوپاکەی بۆ مەدینە گەڕاندەوە.

### شەڕی زی قەرد

پێغەمبــەر(د.خ) بــۆ مەدینــە گەڕایــەوە. چــەند ڕۆژێــك لــەم شــارەدا نەمایــەوە کەعوییەنە کوڕی حسنی فەزاری لەگەڵ سوپاکەی مناڵەکانی غەتەفان هێرشیانکردە سـەر وشترەکانی پێغەمبـەر(د.خ). یەکـەم کـەس لەهێرشـی ئـەوان ئاگـادار بوویـەوە، سـەلەمە کـوڕی ئـەکوەعی سـەلەمی بـوو. ئەبوجەعفـەر کـوڕی جـەریری تەبـەری ئـەم گێرانــەوەی دوای شــەڕی مناڵــەکانی لــەحیان، بەمــشێوەیە لــەکوڕی ئیــسحاق گێراوەتــەوە. گێرانــەوەی ڕاســت لەســەلەمە ئەوەیــە: ئــەم شــەڕە دوای گەڕانــەوەی پێغەمبەر(د.خ) لە حودەیبیە ڕوویدا. لەنێوان ئەم دوو شەڕی جیاوازی کات زۆرە.
سـەلەمە کـوڕی ئـەکوەع دەڵێـت: دوای ئاشـتی حودەیبیـە لەگـەڵ پێغەمبـەر(د.خ) ڕوومــان لەمەدینــە کــرد. پێغەمبــەر(د.خ) وشــترە ســواری و بارییــەکانی خــۆی

بەۆیلەکەی، رەباح بۆ لەوەرین نارد. سوار لەسەر ئەسپی تەڵحە کوڕی عوبەیداللە لەگەڵ ئەو بەرێکەوتم. کاتێك شەومان گەیاندە بەیانی، لەناکاو بینیمان عەبدولڕەحمان کوڕی عویەینە کوڕی حسنی فەزاری هێرشی کردۆتە سەر وشترەکانی پێغەمبەر(د.خ) و هەموویانی لەگەڵ خۆی بردووە و وشترەوانەکەی پێغەمبەری کوشتووە. وتم: ئەی رەباح، ئەم ئەسپە بگرە و بیدە بەتەڵحە و پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار کەرەوە کەبتپەرستەکان هێرشیان کردۆتە سەر وشترەکانی. ئەوسا ڕۆشتمە سەر تەپۆڵکەکە و بەبەرزترین دەنگ هاوارم کرد: ئای فریا کەون، دوژمن هێرشی هێناوە! دواتر شوێن دزەکان کەوتم و بەردەوام تیرم بۆ دەهاویشتن و دەموت:

خذها و انا ابن الاكوع اليوم يوم الرضع

واتاکەی: ئەمە بگرە و بزانە کە من کوڕی ئەکوەعم. ئەمڕۆ رۆژی لەناوچوونی پەستەکانە.

دەڵێت: سوێند بەخوا بەردەوام تیربارانم کردن و ئەسپەکانیانم دەکوشت. کاتێك سوارێك لەوان بۆ شەڕی من هات، لەناو دارێکا خۆم دەشاردەوە و تیرم بۆ دەهاویشت و ئەسپەکەیم دەکوشت و خۆیشی. کاتێك دەگەشتنە تەنگەبەرەکانی کوێستان، لەسەرەوە بەردبارانم دەکردن. ئەم کارەم کرد تا هیچ کام لەوشترەکانی پێغەمبەر(د.خ) نەمایەوە و هەموویانم بەدوای خۆمدا راکێشا. ئەوان، وشترەکانیان بۆمن بەجێهێشت. زیاتر لەسی ڕمیان فرێدایە سەرزەوی تا بارەکەیان سوك بکەن. هەرچیان فرێدەدا من نیشانەیەکم لەسەر دادەنا تا هاوڕێیانی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار ببنەوە. کاتێك گەشتنە ڕێڕەوێکی تەنگ لەکوێستان، عویەینە کوڕی حسن کوڕی حوزەیفە کوڕی بەدر بۆ یارمەتیدانی ئەوان هات. ئەوان دابەزین و بەخواردن سەرقاڵ بوون. کاتێك منی بینی، پرسی ئەمە کێیە؟ وتیان: ئەمە ئێمەی خستۆتە رەنجەوە. هەموو وشترەکانی لێوەرگرتینەوە. لەشوێنی خۆم هەڵنەستام کەبینیم سوارەکانی سوپای پێغەمبەر(د.خ) هاتنە یارمەتیم. ئەوان لەناو دارەکانەوە بۆ پێشەوە دەهاتن. لەپێشیانەوە، ئەخرەمی ئەسەدی موحرەز کوڕی نەزلە لەئەسەد کوڕی خوزەیمە و لەدوای ئەو ئەبوقەتادە و بەدوای ئەم دووانە مقداد کوڕی عەمرۆ

کەندی بوو. من هەوساری ئەسپەکەی ئەخرەمم گرت و وتم: لەم خەڵکە خۆت بەدور بگرە تا وشترەکان لەدەستت دەرنەهێنن و خۆت بەپێغەمبەر(د.خ) بگەیێنیت. وتی: ئەی سەلەمە، ئەگەر باوەڕت بەخوا و ڕۆژی کۆتایی هەیە، من لەگیان بەخشین دورمەخەرەوە. دەڵێت: وازم لێ هێنا. ئەو و عەبدولرەحمان کوڕی عویەینە ڕووبەڕووی یەك بوونەوە و ئەخرەم ئەسپەکەی عەبدولرەحمانی کوشت و عەبدولرەحمان بەشمشێر یا ڕم لەویدا و ئەخرەمی کوشت. عەبدولرەحمان ئەسپەکەی ئەخرەمی بۆ خۆی هەڵگرت. ئەبوقەتادە سوارەی سوپاکەی پێغەمبەر(د.خ) خۆی بە عەبودلرەحمان گەیاند و لێیدا. ئەوان هەڵاتن. سەلەمە وتی: سوێند بەو کەسەی روخساری محەممەدی نورانی کرد، بێ گومان ئەوەندە بەدوای ئەواندا دەڕۆم تا لەهاورێیانی محەممەد هیچ نیشانێك نەبینم.

ئەوان لەکاتی ئاوابوونی خۆر ڕوویان لەئەشکەوتێك کرد کەئاوێکی تیابوو بەناوی زوقەرەد. هەموویان تینو بوون و ویستیان لەو ئاوە بخۆنەوە. سەیری منیان کرد بەغاردان بەدوایانەوەم. ئەوانم لەوێ دورخستەوە و ئەوان یەك چۆڕقاڵ ئاویشیان نەخواردەوە. بەخێرایی خۆیان گەیاندە تەپۆڵکەی زوئەبهەر. من بۆ یەك یەکی ئەوان تیرم دەهاویشت و تیرەکانم بەر شانیان دەکەوت. دەموت: ئەمە بگرە کەمن ئەکوەعم و ئەمڕۆ ڕۆژی لەناوچوونی پەستەکانە. دوو ئەسپم لەسەر تەپۆڵکەکە بینی، ئەوانم گرت و بردم بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) .

مامم عامر بەمەشکێکی پڕ شیر خۆی بەمن گەیاند و مەشکێکیتری پڕ لەئاو هێنا. دەستنوێژم گرت و نوێژم خوێند و ئاوم خواردەوە و ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەوم لەسەر ئەو ئاوە بینی کەدوژمنانم لەزوقەرد لێ دورخستبوویەوە. بینیم پێغەمبەر(د.خ) وشترەکان و هەموو ڕم و جلەکان کەمن لەدوژمنم سەندبوو، هەڵگرتۆتەوە و بیلال بۆ ئەوان وشترێکی سەربڕییەوە و پێغەمبەر(د.خ) سەرقاڵی کەباب کردنی گۆشتەکەیەتی. وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ڕێگە بدە سەد پیاوی شەڕکەر هەڵبژێرم و شوێنیان کەوم و بیانکوژم. پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی و وتی: ئەوان لەسەرزەمینی غەتەفانن. لەم کاتەدا یەکێك لەغەتەفانییەکان هات و وتی: فلان کەس بۆ ئەوان ئاژەڵێکی سەر بڕی. کاتێك پێستەکەیان لێکردەوە، تەپ و تۆزیان

بینی و وتیان: ئێوەیان گەمارۆداوە، لەبەر ئەمە هەڵاتن.

کاتێك شەومان کردە بەیانی، پێغەمبەر(د.خ) وتی: باشترینی سوارەکانی ئێمە ئەبوقەتادەیە و باشترین شەڕکەری پیادەی ئێمە سەلەمە کوڕی ئەکوەع. ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) هەم بەشی سوارەی پێ بەخشیم، هەم بەشی پیادە و منی لەپشت سەری خۆی لەسەر چوارپێکەی (غەزەبا) سوار کرد. بەهەمان شێوە کەبۆ پێشەوە دەڕۆشتین، بینیم پیاوێکی ئەنساری بەخێرایی بەرەو پێش دەڕوات و کەس ناتوانێت خۆی بەو بگەیێنێت. ئەو پیاوە چەند جار هاواری کرد: ئایا کەس هەیە لەسەر خێرا ڕۆشتن لەگەڵ من پەیمان ببەستێت؟ وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، باوك و دایکم قوربانی تۆبن. ڕێگەم بدە لەگەڵ ئەم پیاوە لەسەر خێرا ڕۆشتن پەیمان ببەستم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەئارەزوی خۆت. دەڵێت: من دەستم بەراکردن کرد و خۆم بەو گەیاند و وتم: سوێند بەخوا پێش تۆکەوتم. من پێش ئەو گەشتمە مەدینە. زیاتر لەسێ ڕۆژ لەمەدینە نەماینەوە و بۆ شەڕی خەیبەر ڕۆشتین.

لەم شەڕەدا بۆ یەکەم جار هاواریان کرد: (ئەی سوپاکەی خوا، سوار بن). پێشتر بەم شێوەیان نەدەوت.

## شەڕی مناڵەکانی موستەلیق لەخوزاعە

ئەم شەڕەیان دوای شەڕی زیقەرد ئاماژەوە پێداوە. شەڕ لەشەعبانی ئەم ساڵە یانی ساڵی شەشەمی کۆچی/دێسامبەری ٦٢٧زاییینی ڕوویدا. پێغەمبەریان ئاگادار کردبوویەوە کەمناڵەکانی موستەلیق خۆیان بۆ شەڕ کردن ئامادە کردووە. ڕێبەرەکەیان حارس کوڕی باوکی زەرار باوکی جویرییە، هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) بوو. کاتێك لەم هەواڵە ئاگاداربوویەوە، ڕۆشتەدەر و لەسەر ئاوێك بەناوی موریسیع لەپانتاییەکانی قەدید ڕووبەڕووی ئەوان بوویەوە. شەڕ ڕوویدا و بتپەرستان شکەستیان خوارد وکوشتار کران و پیاوێك لەمناڵەکانی لەیس کوڕی بەکر بەناوی هوشام کوڕی سوبابە برای مقیەس کوڕی سەبابە کوژرا. ئەو بەدەستی یەکێك

لەئەنسار لەهاورێیانی عەباجە کوڕی سامت کوژرا چوونکە بەهەڵە گومانی کرد لەدوژمنانە. پێغەمبەر(د.خ) لەم شەڕەدا ئەسیری زۆری گرت و لەناو موسوڵمانانادا دابەشی کرد. لەناو ئەواندا جویریە کچی حارس کوڕی ئەبی زەرار بوو کەدرا بەسابت کوڕی قەیس کوڕی شەماس یاکوڕە مامەکەی ئەو. کچ لەگەڵ ئەم پیاوەدا پەیمانی ئازادی نووسی. ئەو ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای لێکرد یارمەتی بدات تا بەهای ئازادی خۆی بدات. پێغەمبەر(د.خ) بەکچەکەی وت: ئایا پێشنیارێکی باشترت دەوێت؟ وتی: چی بێت ئەی پێغەمبەر(د.خ) ؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: هەرئێستا بەهای ئازادی تۆدەەم و تۆ وەك هاوسەری خۆم هەڵدەبژێرم. کچ وتی: ئەو کارە بکە ئەی پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) ئەو کارەی کرد. خەڵك کاتێك ئەم داستانەیان بیست وتیان: ئەوان خەزورەکانی پێغەمبەری خوان. لەبەر ئەمە زیاتر لەسەد بنەماڵەیان لەمناڵەکانی موستەلیق ئازاد کرد. هیچ ژنێك نەبینراوە بۆ خەڵکەکەی ئەوەندە پیرۆز و بەهادار بێت. بەهەمان شێوە کەخەڵك لەم گێژاوەدا بوون و لەسەر ئەم ئاوە بەسەریان دەبرد، دەستەیەك لەخەڵکان گەشتن. لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب بەکرێگیراوێکی ئەو لەمناڵەکانی غەفار بوو کەپێیان دەوت جەهجاە. ئەو لەگەڵ سەنانی جوهەنی هاوپەیمانی مناڵەکانی عەوف لەخەزرەجییەکان دەرگیر و لەسەر ئاوەکە شەڕیان بوو. پەلامالاری یەکیاندا. پیاوێکی جوهەنی هاواری کرد: ئەی ئەنسارییەکان، فریام کەون! جەهجاە هاواری کرد: ئای موهاجیرەکان فریام کەون. عەبدوڵلە کوڕی ئەبی سەلول لەم کارە توڕە بوو. هاوڕێ لەگەڵ ئەو دەستەیەك لەخەڵکەکەی بوون کەزەید کوڕی ئەرقەم (هێشتا مناڵێکی گەنج) لەناویاندا بوو. عەبدوڵلە کوڕی ئەبی سەلول پرسی: بەراستی ئەو کارەیان کرد؟ سەیری ئەوان بکەن لەسەر زەمینی خۆمان شەڕمان لەگەڵ دەکەن و لەئێمە زیاتر دەبن. سوێند بەخوا ئەگەر بۆ مەدینە بگەڕێمەوە(بەرێزەکان، پەستەکان دەرپەڕێنن)((مناقون/٨/٦٣)). دواتر ڕوویکردە خەڵکەکەی و وتی: خۆتان ڕێگەتان پێدان و سامانەکەی خۆتان لەگەڵ ئەواندا بەشکرد. سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی پێتان داون لێیان وەربگرنەوە، ڕوودەکەنە شار و سەرزەمینێکیتر.

زەید ئەم وتارەی بیست و پێغەمبەری ئاگادار کردەوە. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ)

لەشەڕ تەواو بووبوو. ئەوبەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) گێڕایەوە و عومەر کوڕی خەتاب لای ئەوبوو. عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، فەرمان بەعیباد کوڕی بشور بدە بیکوژێت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: دواهاتەکەی چی دەبێت کاتێك خەڵکان بڵێن پێغەمبەر(د.خ) بەردەوام هاورێکانی خۆی دەکوژێت! هەستە و بڵێ باخەڵك کۆچ بکەن. ئەو، هەمان سات بەرێکەوت تا کۆتایی بەم کێشە و بگرەوبێنە بێنێت.

لەم کاتەدا ئوسەید کوڕی حەزیر چاوی پێیکەوت و سڵاوی بۆنارد و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کاتێك کۆچت کرد کەشێوەی کۆچ کردن لەکاتێکی وادانەبوو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: نەتبیستوە عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی چی وتووە؟ پرسی: چی وتووە؟ فەرمووی: گومانی بردووە ئەگەر بۆ مەدینە بگەڕێتەوە، بەرێزەکان پەستەکان لەوێ دەردەکەن. ئوسەید وتی: سوێند بەخوا، ئەگەر بتەوێت تۆ ئەو دەردەکەیت چوونکە تۆ بەرێزیت و ئەو پەست. دواتر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بەنەرمی لەگەڵ ئەودا هەڵسوکەوت بکە کەخوا فەرمانی بەخشینی پێداویت. پێش هاتنی تۆ، خەڵکەکەی چەند تاجێکی گەوهەر نیشانیان بۆ دەرازاندەوە تا لەسەر سەری داینێن. ئەو گومان دەکات تۆ پاشایەتیت لێسەندۆتەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی بیستی زەید، پێغەمبەر(د.خ) لەو وتارە ئاگادار کردۆتەوە. ئەو ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و سوێندی خوارد ئەوەی وتراوە، نەموتووە و نەم هێناوەتە سەر زمان. عەبدوڵڵە لەناو کەسەکانی خۆی بەرێز بوو. وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەوانەیە ئەم منداڵە هەڵەی کردبێت. خوا ئەم ئایەی نارد و قسەکانی زەیدی بەراست زانی: کاتێك دووڕووەکان دێنە لای تۆ، دەڵێن: شایەتی دەدەین تۆ نێردراوی خوایت. خوا دەزانێت تۆ نێردراوی ئەویت. و خوا دەزانێت دووڕووەکان لەباوەڕی خۆیان درۆزنەکانن(منافقون/٦٣/١). کاتێك ئەم ئایە هات، پێغەمبەر(د.خ) گوێچکەی زەیدی گرت و وتی: ئەمە ئەو گەنجەیە خوا بیستراوەکانی گوێچکەی بەراست زانی.

عەبدوڵڵە کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی کوڕی سەلول بیستی چی بەسەر باوکی ڕوویداوە. ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بیستوومە دەتەوێت باوکم بکوژیت. ئەگەر دەتەوێت ئەم کارە بکەیت فەرمان بەمن بدە تا

سەری بۆ تۆ بێنم چوونکە دەترسم، فەرمانی کوشتنەکەی بەیەکیتر بدەیت و دوای ئەوە ئاسوودە نابم ببینم کوژەی باوکم لەناو خەڵك بەئازادی بەرێدا دەڕوات. ئەو بکوژم و بەم کارە، پیاوێکی خواپەرستم لەبەرابەر ناباوەڕێك کوشتبێت و بڕۆمە جەهەننەم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەنەرمی لەگەڵ ئەو هەڵسوکەوت دەکەم و تا ئەو کاتەی لەناو ئێمەدابێت بەرێزەوە سەیری دەکەین. دوای ئەوە بەشێوەیەکی لێهات کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەلول کارێکی نەشیاوی دەکرد، خەڵکەکەی سەرکۆنەیان دەکرد و دەیانترساند. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) ئەم هەواڵانەی بیستبوو، بەعومەر کوڕی خەتابی وت: چۆن ئەم کارە دەبینی عومەر! سوێند بەخوا ئەگەر ئەو رۆژەی منت بۆ کوشتنی هاندا، ئەوم بکوشتایە، چەندین کەس بۆ خوێنی ئەو دژی من هەڵدەستان کەئەگەر ئەمڕۆ هەموویان بۆ کوشتنی ئەو فەرمان بدەم، فەرمان دەبەن. عومەر وتی: کاری پێغەمبەر(د.خ) شیاوتر و پیرۆزترە لەکاری من. هەروەها لەم ساڵەدا، مقیەس کوڕی سەبابە هاتە مەدینە و وای نیشاندا باوەڕی بەئیسلام هێناوە. وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) موسڵمان ئاسا هاتمە لای تۆ و هاتم تا خوێنبایی براکەم وەربگرم. ئەو بەهەڵە کوژرا. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی و خوێنبایی براکەی هوشام کوڕی سەبابەیان بەودا. پێشتر ئامارژەمان بەداستانی کوژرانی ئەودا. ئەو ماوەیەکی کورت لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە و لەناکاو هێرشیکردەسەر بکوژی براکەی و کوشتی و لەدین هەڵگەڕایەوە و بۆمەدینە گەڕایەوە و ئەمەی وت:

| | |
|---|---|
| شفى النفس ان قدبات فى القاع مسندا | تضرج ثوبيه دماء الاخادع |
| و كانت هموم النفس من قبل قتله | تلم فتحميني وطاء المضاجع |
| حللت به نذرى و ادركت ثورتى | وكنت الى الاصنام اول راجع |

واتاکەی: دڵم لەم کارە فێنك و ئارام بوویەوە کاتێك ئەوم لەبیابان بینی پاڵی بەدیوارەوە داوە و جلەکانی لەخوێنی شادەماری ملی سورە. ئامۆژگارییەکانی گیان پێش کوشتن هێرشیان بۆ دەهێنام و نەیاندەهێشت لەسەر جێگاکەم ئارام بگرم. بەکوشتنی ئەو پەیمان و سوێندەکەی خۆم بەجێهێنا و تۆڵەی خۆم سەند و یەکەم کەس بووم بۆ لای بتەکان گەڕامەوە.

## داستانی درۆ کردن

داستانی بوختان کردن بۆ هاوسەری بەرێزی پێغەمبەر(د.خ) عایشە لەشەڕی منالّەکانی موستەلیق ڕوویدا.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و بڕێك لەرێگاکەی بڕی، درۆزنەکان قسەی ناشیرینیان وت کەعایشە چۆنیەتییەکەی بەمشێوە دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دەیویست بڕواتە سەفەرێك لەناو هاوسەرەکانی خۆی تیروپشکی دەهاویشت و تیر بەناوی هەرکامیان دەربهاتایە، ئەوی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. کاتێك شەڕی منالّەکانی موستەلیق هاتە پێش، تیروپشکی کرد و تیرەکە بەناوی من هاتەدەر. ژنان لەم کاتەدا بەرکولێکیان دەخوارد وتامی خۆشی گۆشتیان نەدەچێشت. شێوەی من بەجۆرێك بوو، کاتێك وشترەکەم دەهات، لەکەژاوەکەی خۆم دادەنیشتم و ئەو کەسانەی راسپێردرابوون بۆ بردنی وشترەکەی من، دەهاتن و کەژاوەکەی منیان هەڵدەگرت( و من لەناویدا بووم) و دەیانخستە سەر پشتی وشترەکە و ئەوسا هەوساریان دەگرت و دەڕۆشتن. دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەو شەڕە گەڕایەوە (کەنزیك لە مەدینە بوو)، بەشێکی شەوی لەشوێنێك بەسەر برد و دواتر لەگەڵ خەڵك بەرێکەوت. من بۆ کارێك رۆشتبوومەدەر و گەردنبەندێك لەگەوهەرکانی سەرزەمینی (زوفارم) لەگەردندابوو کەلە گەردنم کەوتبوو و من ئاگادار نەبووم. کاتێك گەڕامەوە، بەدوای گەردنبەندەکەدا گەڕام بەلاّم نەمدۆزییەوە. خەڵك کۆچیان کرد و من ڕۆشتمە شوێنێك، کەپێشتر لەویّ بووم و گەردنبەندەکەم دۆزییەوە. ئەو کەسانەی دانرابوون بۆ هەڵگرتنی وشترەکەی من هاتن و کەژاوەکەیان هەڵگرت و گومانیان دەکرد من لەناو کەژاوەکەدام. وەك هەمیشە، کەژاوەکەیان خستە سەر پشتی وشترەکە و بەرێکەوتن. گەڕامەوە بۆ شوێنی لەشکر و لەویّ کەسم نەبینی. پێستەیەکم لەدەوری خۆمەوە ئالاّند و لەشوێنەکەی خۆم خەوتم و زانیم کاتێك من نەبینن، دەگەڕینەوە و من لەگەڵ خۆیان دەبەن.

دەڵێت: سوێند بەخوا خەوتبووم کەلەناکاو سەفەوان کوڕی موعەتەلی سولەمی لای منەوە تێپەڕی. ئەو بۆ کارێك لەلەشکر بەجیّ مابوو. کاتێك ڕەشایی منی بینی،

بەرەو لام هات و لەسەر سەرم راوەستا و منی ناسییەوە چوونکە پێشتر منی بینیبوو. کاتێك منی بینی، وتی: ((هەموومان لای خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە)(بەقرە/٢/١٥٦). وتی: بۆ بەجێ ماویت؟ وەلأمم نەدایەوە و قسەم لەگەڵ نەکرد. ئەوسا وشترەکەی هێنا و وتی سواربە. سوار بووم و ئەو هەوساری وشترەکەی گرت و بەپەلە بەرێکەوت.

کاتێك خەڵك وەستان و وچانیان گرت، پیاوێك دەرکەوت کەمنی لەگەڵ خۆیدا بۆ پێشەوە دەبرد. لەمکاتەدا درۆزنەکان سەبارەت بەمن دەستیان بەدرۆ کردن کرد و سوپا شڵەژا و هیچم لەمە نەدەزانی. دواتر گەڕاینەوە بۆمەدینە و من نەخۆش کەوتم و ئەم هەواڵە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەشت و باوك و دایکم زانیان بەلأم هیچیان بەمن نەوت. جگە لەوەی هەندێ نامیهرەبانی پێغەمبەرم بەناشنا بینی. کاتێك دەهاتە لای من و دایکم پەرستاری منی دەکرد، دەیپرسی: نەخۆشەکەتان چۆنە؟ هیچی تری نەدەوت. من لەناخی خۆمدا لەم نامیهرەبانییەی ئەو خەمبار دەبووم و داوای فەرمانێکم لێ کرد تا برۆمە لای دایکم و ئەو پەرستاریم لێ بکات. ئیزنی دام و رۆشتمە لای دایکم و هیشتا لەوەی روویدابوو، ئاگادار نەبووم تا ئەوەی دوای بیست و چەند شەو باشبوومەوە.

دەڵێت: ئێمە خەڵکێکی بەرەچەڵەك عەرەب بووین و لەناوماڵەکانی خۆمان ئاوەڕۆمان نەبوو و ئەوەمان بەناخۆش و قێزەون لەقەڵەم دەدا. ژنان شەوانە بۆ گمیز کردن دەڕۆشتنەدەر. شەوێك من بۆ ئەو کارە ڕۆشتمەدەر و دایکی میستەح کچی باوکی رۆهم کوڕی موتەلیب لەگەڵمدا بوو. دایکی پوری ئەبوبەکری راستگۆ بوو. دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو بەرێگادا دەڕۆشت کەداوێنی کراسەکەی لەقاچی ئالأ و کەوت و وتی: مەرگ و نەحلەت بۆ میستەح. وتم: چ قسەیەکی ناشیرینیت بەیەکێك لەموهاجیرەکان وت کەلە شەڕی بەدر ئامادە بووە. وتی: هێشتا هیچ لەبەسەرهاتەکەی نازانی؟ وتم: کام بەسەرهاتە؟ ئەو منی لەچۆنییەتی داستانەکە ئاگادار کردەوە. دەڵێت: سوێند بەخوا نەمتوانی کارەکەی خۆم بکەم(گمیز بکەم) گەڕامەوە و بەردەوام دەگریام تا ئەوەندەی گومانم کرد گریان جەرگم لەت لەت دەکات. بەدایکم وتی: ئەم خەڵکە ئەم هەموو قسەیان لەبارەی منەوە وتووە و تۆ

هیچیانت پێ نەوتەوم؟ وتی: کچم، زۆر گوێی پێ مەدە. سوێند بەخوا کەمتر ڕوودەدات ژنێکی جوان لەماڵی پیاوێکدا بێت کەخۆشی بووێت و ئەو چەندین هەوێی هەبێت و قسەی ناشیرینی لەبارەوە نەکەن. دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەناو خەڵکدا وتاریدا (و من ئاگادار نەبووم) و فەرمووەی: ئەی خەڵکینە، بۆ خەڵکانێك لەئێوە، سەبارەت بە بنەماڵەکەم ئازار دەدەن و بوختان بۆژنەکانی من هەڵدەبەستن کەراست و دروست نییە. ئەمانە سەبارەت بەپیاوێك دەڵێن سوێند بەخوا لەو جگە باشیم نەدیوە و جگە لەگەڵ من بۆ هیچ کام لەماڵەکانم نەهاتووە.

ئەم کارە لای عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەلول و پیاوانێك لەخەزرەج گەورە بوویەوە و ئەمە هاوڕێ بوو لەگەڵ ئەو قسانەی مێستەح کەوتی و حەمنە کچی حەجەش هێنایە سەر زمان. چۆنییەتیەکەی ئەوەی زێنەب خوشکی ئەم ژنە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) بوو و تا توانی بڵاوی کردەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەو وتاری هێنایە سەر زمان، ئوسەید کوڕی حوزەیر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر درۆزنەکان لەئەوسییەکان بن، زیانی ئەوان لەتۆ دوور دەکەینەوە و ئەگەر لەبراکانی ئێمە خەزرەج بن، فەرمان بدە تا فەرمانی تۆ بەکار ببەین. سەعد کوڕی عیبادە وتی: ئەمە قسەیەت تەنیا بۆ ئەوە کرد چوونکە دەتزانی ئەوان لەخەزرەجیەیکانن. ئەگەر لەخەڵکەکەی تۆ دەبوون، ئەو قسەت نەدەهێنایە سەر زمان. ئوسەید وتی: درۆت کرد و پیاوێکی دووڕوویت و لەدووڕووەکان پشتیوانی دەکەیت. خەڵك ڕووبەڕووی یەك وەستانەوە و بەتوندی لەگەڵ یەك قسەیان کرد و ئەوەندەی نەمابوو شەڕ لەناو ئەواندا دروست ببێت. پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنی وتاردان هاتەخوار. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئوسامە کوڕی زەیدی بانگ کرد و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد. ئوسامە بەچاکە باسی منی کرد و عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ژنان فراوانن، جیاواز لەوە، لەپەرستارەکەی بپرسە تا ڕاستییەکەی بەتۆ بڵێت. پێغەمبەر(د.خ) بەریرەی بانگ کرد و پرسیاری لێکرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەشوێنەکەی هەستا و بەتوندی لەم ژنەیدا و وتی: ڕاستییەکان بەپێغەمبەری خوا بڵێ. ژن وتی: بەخوا جگە لەچاکە نازانم، تەنیا کەم و کوڕییەك لەعایشەم بینیوە، ئەوەیە کاتێك بۆ نان کردن هەویری ئامادە دەکرد، دەخەوت و ئاژەڵە ماڵییەکان دەهاتن و هەویرەکەیان دەخوارد.

ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) هاتە لای من و لای من باوکم و دایکم ژنێکی ئەنساری لێبوو. من و ئەم ژنە دەگریایین. پێغەمبەر(د.خ) سوپاسی خوای کرد و دروودی بۆ نارد و دواتر وتی: ئەی عایشە، قسەی خەڵك بەرگوێت کەوتووە، ئەگەر کارێکی خراپت کردووە، بۆ لای خوا بگەرێرەوە و داوای لێخۆشبوون بکە.

دەڵێت: سوێند بەخوا فرمێسکم کەم بوویەوە تا ئەوەندەی بەشێوەییەك نەمدەتوانی وەلآم بدەمەوە. چاوەڕوانی دایك و باوکم بووم تا وەلآمی بدەنەوە بەلآم هیچیان نەوت. وتم: ئایا وەلآمی نادەنەوە؟ وتیان: سوێند بەخوا نازانین چی بڵێین. هیچ بنەماڵەیەکم نەدەناسی ئەو ڕۆژانە وەك بنەماڵەی ئەبوبەکر گرفتار بووبێت. کاتێك دایك و باوکم بێدەنگ بوون وتم: سوێند بەخوا هەرگیز لەوەی وتت، بۆ لای خوا ناگەرێمەوە و داوای لێخۆش بوون ناکەم. سوێند بەخوا ئەگەر بەقسەی خەڵك ڕازی بم ( و بیّ گومان دەزانم بیّ گوناحم) تۆ من بەراستگۆ دەزانی و ئەگەر قسەی ئەوان بەناڕاست بزانم، تۆ بەدرۆزنم دەزانی. ئەوکات لەمێشکی خۆمدا بەدوای ناوی یەعقوبدا گەڕام و نەمدۆزییەوە و وتم: من ئەو شتە دەڵێم کەباوکی یوسف وتی: خۆراگری چاکەی پێویستە و خوا لەبەرابەر ئەوەی دەیڵێن، باشترین یارمەتیدەرە(یوسف/١٢/١٨). پێگەی خۆم ئەوەندە بەکەم زانی کەکەمتر لەوەم خوا سەبارەت بەمن قورئان بنێرێت و خەڵك بیخوێنن. هیواداری ئەوە بووم خەوێك ببینێت و خوا لەخەودا درۆبوونی قەسی خەڵك بۆ ئەو ڕون بکاتەوە.

دەڵێت: سوێند بەخوا پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنەکەی خۆی هەڵنەستا کەنێردراوی خوایی گەیشت. پێغەمبەریان لەجل و بەرگەکەیەوە پێچا. بەلآم من، سوێند بەخوا نەترسام و نە شڵەژام. باش دەمزانی بیّ گوناحم و خوا ستەم لەمن ناکات. بەلآم دایك و باوکم، وەحی لەپێغەمبەر(د.خ) دوور نەکەوتەوە مەگەر ئەوەی گومانم برد گیانیان لەترسا هاتۆتە سەر لێو کەنەکا خوا ئەوەی خەڵك دەیڵێن بەراست بزانێت.

لەم کاتەدا نێردراوی خوایی لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و دڵۆپەکانی عارەق وەك گەوهەر بەروخساریدا دەباری. هەستا و بەردەوام عارەقی ناوچاوانی دەسڕی و وتی: ئەی عایشە، مژدەت لیّ بێت، خوا بیّ گوناحی تۆی بۆ من ئاشکرا کرد. وتم: سوپاس بۆ خوا. دواتر ڕۆشتە لای خەڵك و قسەی بۆ کردن و ئەوەی خوا لەقورئاندا

سەبارەت بەمن ناردبووی، بۆ ئەوانی خوێندەوە و دواتر فەرمووی بەقامچی لەمێستەح کوڕی ئوساسە و حەسان کوڕی سابت و حەمنە کوڕی جەحش (کەبەئاشکرا بەخراپی باسی منیان کردبوو)، بدەن.

ئایەکان ئەمانە بوون: ئەوانەی ئەم درۆیان سازکرد، دەستەیەك لەئێوە بوون. ئەوە بۆ خۆتان بەخراپ مەزانن بەڵکو ئەمە بۆ ئێوە باشترە. هەر کام لەوان بەئەندازەی ئەو گوناحەی کردوویەتی، سزا دەدرێت وئەوەی گەورەترین بەشی ئەم درۆیەی هەڵبەست، ئەشکەنجەیەکی گەورە. چوونکە کاتێك ئەم درۆیەیان بیست، ژنان و پیاوانی خواپەرەست، گومانی باشەیان لەخۆیان نەکرد؟ دەبوا بڵێن: ئەمە درۆیەکی گەورە و گرانە. بۆ درۆزنەکان بۆ وتەکانی خۆیان چوار شایەتیان نەهێنا؟ کەواتە چوونکە شایەتیان نەهێنا ئەمانە لای خوا درۆزنەکانن. ئەگەر بەخشین و خۆشەویستی خوا لەم دنیا ولەو دنیا بۆ ئێوە نەدەبوو، ئێوە بەهۆی ئەوەی دەتانهێنایە سەر زمان، ئەشکەنجەیەکی گەورەتان پیێ دەبڕا. کاتێك بەزمان لەزمانی خۆتاندا دەتانسوڕان و بەدەم ئەو قسانەتان دەهێنایە سەر زمان کەزانیاریتان لەسەری نەبوو. ئەم کارەتان بەسوك و کەم بەها لەقەڵەمدا بەڵام لای خوا گەورە و گرانە. چوونکە ئەوەی بیستان، نەتانوت: ئەی خوایە، تۆ پاکیت! ئەمە درۆیەکی گەورەیە. خوا ئێوە ئامۆژگاری دەکات ئەگەر خواپەرەستن، هەرگیز کاری لەم شێوە لەئێوە ڕوونەدات. خوا نیشانەکانی خۆی بۆ ئێوە باس دەکات و خوا زانای فرەزانە. ئەوانەی دەیانەوێت خراپە لەناو خواپەرستان بڵاو ببێتەوە، لەم دنیا و لەو دنیا ئەشکەنجەیەکی گەورە چاوەڕوانیان دەکات و خوا دەزانێت و ئێوە نازانن. ئەگەر بەخشین و خۆشەویستی خوا بۆ ئێوە نەدەبوو و ئەگەر نە ئەوەبوایە کەخوا بەخشەر و میهرەبانە. ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخوا هێناوە، بەدوای هەنگاوەکانی شەیتاندا مەڕۆن و هەرکەس بەدوای هەنگاوی شەیتاندا بڕوات، دەبێت بزانێت ئەو بەخراپە فەرمان دەدات. و ئەگەر بەخشینەکانی خوا بۆ ئێوە نەدەبوو هیچ کام لەئێوە پاك نەدەبوونەوە. بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێت، پاك دەکاتەوە و خوا بیسەری زانایە(نور/٢٤/١١-٢١).

ئەوسا ئەبوبەکر سوێندی خوارد هیچ کات خەرجی بەمیستەح نەدات. خوا ئەم

ئایەی نارد: دەبێت بەتواناکان بۆ بەخشین و بەتوانایی لەسەر خەرج نەکردن سوێند نەخۆن کە بەخزمان و هەژاران و کۆچکەرانی ڕێگەی خوا هیچ نەدەن. دەبێت لێبووردنیان هەبێت. ئایا ناتانەوێت خوا لێتان خۆش بێت؟ خوا بەخشەرێکی مێهرەبانە (نور٢٤/٢٢). لەم کاتەدا ئەبوبەکر وتی: دەمەوێت خوا بمبەخشێت و لێم خۆش بێت. ئەو خەرجی میستەحی بۆ گەڕاندەوە. دواتر سەفوان کوڕی موعەتەل بەشمشێری دەرکێشراو ڕێگەی لە حسان کوڕی سابت گرت و بەشمشێری لێیدا و دواتر وتی:

تلق ذباب السيف عنى فاننى غلام اذا هوجيت لست بشاعر

واتاکەی: لێدانی دەمی شمشێر لەمن وەربگرە کەئەگەر زمان بۆ خراپی من بکەنەوە، کوڕێکی ئازا و چالاك بم نەوتاردەرێکی زمان درێژ.

لەم کاتەدا سابت کوڕی قەیس کوڕی شەماس لەشوێنەکەی هەستا و دوو دەستی ئەوی بەملیەوە بەست و بەرێکەوت تا بیباتە لای حارسی کوڕی خەزرەج. لەرێگادا ڕووبەڕووی عەبدوڵڵە کوڕی ڕەواحە بوویەوەو وتی: ئەمە چییە؟ وتی: بەشمشێر لەحسان کوڕی سابتیدا و گومانم نییە ئەوەی کوشتووە. عەبدوڵڵە وتی: ئایا پێغەمبەر(د.خ) لەکارەکەی تۆ ئاگادارە؟ وتی: نە، سوێند بەخوا. وتی: کارێکی خراپت کرد، ئەو پیاوە ئازاد بکە. ئەو سەفوانی ئازاد کرد. ئەمە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت. ئەو سەفوان کوڕی موعەتەل و حسان کوڕی سابتی بانگ کرد. سەفوان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم پیاوە زمانی بۆ سەرکۆنە کردنی من کردەوە و منی ئازاردا و بەشمشێر لێمدا. پێغەمبەر(د.خ) بەحسانی وت: ئەی حسان، چاکە بکە و لێی خۆشبە. حسان وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەوم بەتۆ بەخشی. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) لەبەرابەر ئەم کارەی (بەیرەحای) پێ بەخشی و ئەمە هەمان کۆشکی منداڵەکانی حودەیلە بوو. هەروەها کەنیزێکی قبتی بەناوی شیرین کەخوشکی ماریە دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(د.خ) بوو، بەو بەخشی. ئەم کچە عەبدولرەحمانی بۆ ئەو هێنایە دنیا. سەفوان کوڕی موعەتەل پیاوێکی خۆپارێز بوو و لەگەڵ ژنان تێکەڵاوی نەدەکرد. ئەو لەرێگەی خوادا گیانی بەخشی.

## عومرەی حودەیبیە

لەم ساڵەدا لە زیقەعدە/ مارسی ٦٢٨ زایینی پێغەمبەر(د.خ) بۆ عەمرە کردن ڕۆشتەدەر و نەیدەویست شەڕ بکات. لەگەڵ ئەو دەستەیەك لەموهاجیران و ئەنسار بوون و شوێن کەوتوانێك لەعەرەبەکان ئەوانیان هاورێیەتی دەکرد. ژمارەیان هەزار و چوارسەد یا هەزار وپێنسەد یا سێیەد کەس بوو. ئەو چەندینم ئاژەڵی قوربانی بەرەو بارەگایی خوایی دەبرد لەگەڵ حەفتا وشتری قوربانی تا خەڵك بزانن ئەو وەك زیارەت کەری ماڵی خوا هاتووە نەك وەك شەڕکەر. کاتێك گەشتە شوێنێك بەناوی عوسفان، بوسری کوڕی سوفیانی کەعبی چاوی پێیکەوت و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، قوڕەیشییەکان لەهاتنی تۆ ئاگادار بوونەوە و هەموویان لەزی تەوێ کۆبوونەتەوە و سوێندیان بەخوا خواردوە هیچ کات لەمەککە ڕووبەڕوویان نابیتەوە. ئەوان خالید کوڕی وەلیدیان لەپێش خۆیانەوە بۆ کوراع ئەلغەمیم ڕەوانە کردووە.

دەستەیەك دەڵێن: خالید موسوڵمان و لەگەڵ پێغەمبەردا بوو و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ کوراع ئەلغەمیم نارد کەڕووبەڕووی عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل بوویەوە و ئەوی تێکشکاند. وتاری یەکەم ڕاستترە.

کاتێك بوسر، پێغەمبەر(د.خ) لەبارودۆخی قوڕەیشییەکان ئاگادار کردەوە، وتی: هاوار لەقوڕەیشییەکان کەشەڕ ئەوانی خواردووە. چی دەبوو ئەگەر ئەوان منیان بۆ خەڵکانیتر ئازاد دەکرد؟ ئەگەر خەڵك بەسەر مندا زاڵ بوونایە، ئەوە بوو کەئەوان دەیانویست و ئەگەر من سەرکەوتنم بەدەست بهێنایە، باوەڕیان بەئیسلام دەکرد دەستەکانیان پڕ دەبوو لەخواستە جیهانییەکان. سوێند بەخوا بەردەوام لەسەر ئەوەی خوا منی بۆ ناردووە، لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەم تا خوا ئایینەکەی خۆی سەرکەتوو بکات یا سەر لەلاشەی من جیا ببێتەوە.

دواتر بەرێگایەکدا ڕۆشت جیاواز لەو ڕێگایەیی قوڕەیشییەکان لەسەری دانیشتبوون و بەرەو لای ڕاست ڕۆشت تا گەشتە تەپۆلکەی مورار لەحودەیبیە. لێرەدا وشترەکەی کەوتە سەرچۆك. خەڵك وتیان: وشتر لەڕۆشتن پەکی کەوت.

فەرمووی: لەڕۆشتن پەکی نەکەوت، بەڵکو بۆ ڕێگرتن لەپیلانی خەڵکانی مەککە، لەڕۆشتن وەستا. ئەمڕۆ قورەیشییەکان لەسەر هەر داوایەك بانگی من بکەن، کەتیایدا بەهێز کردنی پەیوەندی خزمایەتی بێت، وەلأمیان دەدەمەوە. ئەوسا بەخەڵکەکەی وت: دابەزن. وتیان: لەم دۆڵەدا ئاو نییە. ئەو تیرێکی لەتیردانەکەی خۆی دەرهێنا و دای بەپیاوێك لەهاورێکانی کەخستیە ناو چاڵێکی کۆن و ئاو هەڵقولا ئەوەندەی خەڵك چوارپێکانی خۆیان لەدەوری ئاوەکە دوورخستەوە. ناوی ئەو کەسەی تیرەکەی لێ وەگرت، ناجیە کوڕی عومەیر جڵەوداری وشترە قوربانییەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

لەمکاتەدا بودەیل کوڕی وەرقە هاورێ لەگەڵ چەند کەس لەگەڵ خەڵکەکەی لەخوزاعە هاتنە لای. خوزاعیەیکان هەموویان لەچاکەخوازەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون لەناو خەڵکی تەهامە. وتی: کەعب کوڕی لۆئەی و عامر کوڕی لۆئەیم بەجێهێشت کەلەسەر ئاوە ڕەوان و هەمیشەییەکانی حودەیبیە دابەزیون. ئەوان مەبەستی شەڕکردن لەگەڵ تۆ و ڕێگرتن لەتۆ بۆ چوونە ناو بارەگایی خواییان هەیە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئێمە بۆ شەڕ لەگەڵ هیچ کەس نەهاتووین، هاتووین حەجی عومرە بکەین. ئەگەر قورەیشییەکان بیانەوێت بۆ ماوەیەك مۆڵەتمان پێ بدەن تا لەو ماوەدا من و خەڵکەکەم بەتەنیا جێ بێڵن. ئەگەر نەیانەوێت سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، لەگەڵ ئەوان لەسەر پەیامەکەی خۆم ئەوەندە شەڕ دەکەم تا سەر بەجەستەمەوە نەمێنێت.

بودەیل ڕوویکردە قورەیشییەکان و ئەوانی لەوتارەکەی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار کردەوە. عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی هەستا و وتی: ئەم پیاوە ڕێگەی ڕاستی نیشانداون، بەپێشنیاەکەری ڕازی بن. ڕێگە بدەن بڕۆمە لای. وتیان: بڕۆ بۆ لای. ئەو هات و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) گفتوگۆی کرد. وتی: ئەی محەممەد، چەندین پیاوی پەستت لەخەڵکەکەی خۆت لەدەوری خۆت کۆکردۆتەوە و ئێستا گەڕاویتەوە بۆ ماڵەکەی خۆت تا لەناویان بەریت. ئێستا قورەیشییەکانن لەگەڵ خۆیان وشتر و ئاسکی تازە زاویان هێناوە وپێستی پڵنگیان پۆشیوە و لەگەڵ خوادا پەیمانیان بەستوە هەرگیز ڕێگە نەدەن تۆ بەزۆر بڕۆیتە ناو ئەم شارە. سوێند بەخوا من

دەبینم ئەوان لەدەوری تۆ بلاوەی لێدەکەن. ئەبوبەکر وتی: قیتکەی لات بمژە! ئایا ئێمە لەدەوری ئەوبلاوەی لێدەکەین؟ عوروە وتی: ئەی محەممەد، ئەمە کێیە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: کوڕی ئەبو قەحافە. عوروە وتی: سوێند بەخوا، ئەگەر لەبەر بەخشینەکانی پێشوی تۆ نەدەبوو بۆ من، لەبەر ئەم بێ شەرمیەت، سزام دەدایت. ئەوسا عوروە دەستی بۆ ریشی پێغەمبەر(د.خ) برد و گرتی و لەگەڵ ئەودا قسەی کرد. موغەیرە کوڕی شەعبە زرێپۆش لەسەر سەری پێغەمبەر(د.خ) وەستابوو. هەرجار عوروە دەستی بۆ ریشی پێغەمبەر(د.خ) دەبرد، موغەیرە دەستی دەگرت و دەیوت: دەستی خۆت کورت کەرەوە پێش ئەوەی هەرگیز بۆ تۆ نەگەڕێتەوە. عوروە وتی: ئەمە کێیە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەمە کوڕی براکەت موغەیرەیە. عوروە وتی: ئەی خراپەکار، ئایا دوێنێ نەبوو، خراپییەکانی تۆم سڕییەوە؟ موغەیەر سیانزە کەس لەمناڵەکانی مالیکی کوشتبوو و رایکردبوو. دو تایەفە یانی مناڵەکانی مالك خزمی کوژراوەکان و ئەخلاف، خزمەکانی موغەیرە، ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و نزیك بوو شەڕ لەناو ئەواندا هەڵگیرسێت. عوروە سیانزە خوێنبایی بۆ کوژراوەکاندا و بەئاشتی کۆتایی بەکێشەکە هێنا.

گفتوگۆ لەناو ئەوان درێژەی کێشا. پێغەمبەر(د.خ) هەمان شتی وت کەبە بودەیلی وتبوو. عوروە وتی: ئەی محەممەد، بڕوانە ئەگەر خەڵکەکەت بەتەواوی لەناو بەریت، ئایا بیستووتە پێش تۆ هیچ کام لەعەرەبەکان خەڵکەکەی خۆیان بەتەواوی لەناو ببەن؟ ئەو بەردەوام سەیری هاورێیانی پێغەمبەری دەکرد. سوێند بەخوا هیچ ئاوێك لەلوت یا دەمیەوە نەدەکەوتە خوار مەگەر دەستی یەکێك لەوان دەیگرت و لەسەر و روخساری خۆی دەسوو. فەرمانی بەهەرکەس دەدا بەپەلە ئەنجامی دەدا و کاتێك دەستنوێژی دەگرت، نزیك بوو یەکتر لەسەر دڵۆپە ئاوە ڕژاوەکان لەدەست نوێژەکەی ئەو، بکوژن. هیچکام لەوان بەتوندی سەیری نەدەکرد چوونکە ئەویان زۆر بەگەورە دەزانی.

عوروە بۆ لای هاورێکانی خۆی گەڕایەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، ڕۆشتمە لای سزار و نەجاشی و خوسرەو. سوێند بەخوا هیچ پاشایەکم نەدیوە هاورێیانی ئەوەندە بەرێزەوە سەیری بکەن کەهاورێیانی محەممەد بەرێزەوە لێی دەڕوانن.

ئەوەی بینیبووی، گێڕایەوە و پەیامەکەی پێغەمبەر(د.خ) پێ وتن.

ئەوکات پیاوێك لەکەنانە بەناوی حولەیس کوڕی عەلقەمە سەروەری ئەحابیش (هاوپەیمانانی قورەیش لەمەککە) هەستا و وتی: ڕێگە بدەن بڕۆمە بینینی ئەو. وتیان: بڕۆ. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بینی، فەرمووی: ئەمە فلانی لەفلان خەڵکە کەوشتری قوربانی بەگەورە دادەنێن، ئەو ئاژەڵانەی بۆ قوربانی ئامادە کراون، بەرەو لای ئەو لێخوڕن. کاتێك ئاژەڵەکانی بینی، بەرەو لای قورەیش گەڕایەوە و پێغەمبەری نەبینی. وتی: ئەی خەڵکینە، شتێکم بینی ناتوانین بیگەڕێنینەوە. ئاژەڵە قوربانییەکان لەگەڵ گەردنبەندەکانیان بوون. وتیان: دانیشە کەبیابانگەڕێکی نەزانیت و لەکاری ئەو ئاگادار نیت. حەلیس وتی: سوێند پەیمانم لەگەڵ ئێوە نەبەستووە ڕێگری لەکەسێك بکەن کەهاتووە سەردانی ماڵی خوا بکات. سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، یا ڕێگەی محەممەد دەکەنەوە یا ئەحابیش وەك یەك کەس دژی ئێوە هاندەدەم. وتیان: ئارام بە، واز لەئێمە بێنە ئەی حولەیس، تا چارەی کاری خۆمان بکەین.

دواتر پیاوێك کەمێکرەز کوڕی حەفسیان پێدەوت، هەستا و وتی: ڕێگە بدەن تا بڕۆمە لای. وتیان: بڕۆ. کاتێك لەدورەوە لای پێغەمبەر(د.خ) دەرکەوت، بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەمە پیاوێکی خاوەن شکۆیە. لەم کاتەدا کەپێغەمبەر(د.خ) قسەی لەگەڵ دەکرد، سوهەیل کوڕی عەمرۆ هات. پێغەمبەر(د.خ) وتی: کارەکەی ئێوە ئاسان بوو(سوهەیل هات و کار ئاسان بوو).

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: قوڕەیشییەکان دوای ئەوەی سوهەیلیان نارد کەپێغەمبەر(د.خ) عوسمان کوڕی عەففانی وەك نوێنەری خۆی بۆ لای ئەوان نارد. دەڵێت: کاتێك عوروە کوڕی مەسعود بۆ لای ئەوان گەڕایەوە، پێغەمبەر(د.خ) خێراش کوڕی ئومەییەی خوزاعی سوار لەسەر وشترێکی خۆی بەناوی (سەعلەب) بۆ لای قوڕەیشییەکان نارد تاپەیامەکەی بگەیێنێت. ئەوان وشترەکەی پێغەمبەریان دابەزەویدا و ویستیان سەری بڕن، بەلام ئەحابیش پشتیوانییان لێکرد و ئازادیان کرد کە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە. دواتر پێغەمبەر(د.خ) عومەر کوڕی خەتابی بانگ کرد تا ڕەوانەی مەککەی بکات. عومەر وتی: لەشاری مەککە لەهۆزی

منداڵـەکانی عـودەی، کەسـی لـێ نییـە پارێزگـاری لـەمن بکـات. قورەیـشییەکان دوژمنایەتی من لەگەڵ خۆیان دەزانن و دەترسم بەدەستی ئەوان بکوژرێم. عوسمـان کـوڕی عـەففان بنێـرە کـە لـەمن بەشـکۆتر و ڕێزدارتـرە. پێغەمبـەر(د.خ) عوسمـانی بانگکرد و ئەوی ڕەوانە کرد تاپەیامەکەی ببات. ئەو ڕۆشت و ئەبان کوڕی سـەعید کـوڕی عاسـی بـینی و پەنایـدا. عوسمـان ڕۆشـتە لای ئەبوسـوفیان و گـەورەکانی قورەیش و پەیامەکەی پێغەمبەری پێراگەیاندن. کاتێك پەیامەکەی وت، پێیـان وت: ئەگەر دەتەوێت بڕۆیت بەدەوری ماڵی خـوادا بسوڕێیتەوە، ئەو کارە بکە. وتـی: تا پێغەمبـەر(د.خ) نـەگات و بـەدەوری مـاڵی خـوادا نەسـوڕێت، ئـەو کـارە ناکـەم. قورەیشییەکان ئەویان لای خۆیـان هێشتەوە. ئەم هەواڵـە بـەگوێی پێغەمبـەر(د.خ) گەیشت کەئەو کوژراوە.، فەرمووی: لێرە ناجولێم تا شەڕ لەگەڵ ئەم خەڵکە بکەم.

ئەوسا داوای لەخـەڵك کـرد بەیعـەتی لەگـەڵ ببەسـتن. خـەڵك لـەژێر داری سـەمورە پەیمانی گوێڕایەڵیان لەگەڵ بەست و جگە لەجەد کوڕی قـەیس کـەس لـەڕێورەسمی پـەیمان بەسـتن پاشەکشەی نـەکرد. یەکـەم کـەس پـەیمانی لەگـەڵ بەسـت پیاوێـك لەمناڵـەکانی ئەسـەد بـوو کـەپێیان دەوت بـاوکی سـەنان. لـەم کاتـەدا هـەواڵ هـات کەعوسمان کوڕی عەففان نەکوژراوە.

دواتر قورەیشییەکان سوهەیل کوڕی عەمر برای منداڵەکانی عامر کوڕی لۆئەییان بۆلای پێغەمبەر(د.خ) نارد تاپەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستێت لەسەر ئەو بنەمایەیی ئـەو سـاڵە لەشـارەکەی ئـەوان بگەڕێتـەوە. سـوهەیل گـشتە لای پێغەمبـەر(د.خ) و گفتوگـۆ لـەنێوان ئـەوان درێـژەی کێـشا و ئـەو دووانـە لەیـەك جیابوونـەوە و دواتـر پـەیمانی ئاشـتیان بەسـت. پێغەمبـەر(د.خ) عـەلی کـوڕی ئـەبی تـالیبی بـانگ کـرد و وتـی: بنوسـە(ئـەی خوایـە، بـەناوی تـۆ) عـەلی نوسـی. دواتـر وتـی: بنوسـە( ئەمـە پـەیمانێك کەمحەممـەد پێغەمبـەری خـوا لەگـەڵ سـوهەیل کـوڕی عـەمرۆ بەسـتی. سوهەیل وتی: ئەگەر دەمانزانی تۆ پێغەمبەری خوایت، شەڕمان لەگەڵ تۆ نەدەکرد. ناوی خۆت و نـاوی باوکت بنووسە. پێغەمبـەر(د.خ) بەعەلی وت: پێغەمبـەری خـوا ڕەش بکەرەوە. عەلی وتی: هەرگیز ڕەشی ناکەمـەوە. هیـچکات نیشانی پێغەمبـەری لەسـەر تـۆ هـەڵناگرم. پێغەمبـەر(د.خ) ئـەو بەرگـەی لەدەسـتی عـەلی وەرگـرت( ئـەو

نەیدەتوانی بەجوانی بنوسێت) و لەجیاتی پێغەمبەری خوا نووسی محەممەد کوڕی عەبدوللە. بەعەلی وت: بێ گومان گیرۆدەی ئەزمونێکی لەمشێوە دەبیت. پەیمانەکەیان بەوشێوە نووسی کە( محەممەد کوڕی عەبدوللە و سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەسەر ئەو بنەمایە ئاشتیان کرد کە) بۆ ماوەی دەساڵ شەڕ لەخەڵك دووربکەنەوە و هەر کام لەقوڕەیشییەکان بۆ پەرەستین ڕووبکاتە پێغەمبەر(د.خ)، بیگەڕێنێتەوە و هەرکام لەیارانی محەممەد بگەڕێتەوە بۆ لای قوڕەیشییەکان، نەیگەڕێننەوە. هەر کەس بیەوێت لەژێر پەیمان و سێبەری پێغەمبەری خوادا بێت، ڕەوا بێت و هەر کەس بیەوێت دەتوانێت لەژێر ئالآی قوڕەیشییەکاندا بێت. خوزاعییەکان پۆشتنە ژێر سێبەری پێغەمبەر(د.خ) و پەیمانەکەی و منالەکانی بەکر چونە ژێر ئالآی قوڕەیشییەکان. پێغەمبەر(د.خ) لەوساڵەدا لەشارەکەی ئەوان بگەڕێتەوە. بۆ ساڵی داهاتوو ڕێگەیان لێ نەگیرێت و دەتوانن لەگەڵ هاوەڵەکانتان بەدەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەوێ بمێننەوە و کەرەستەی شەڕی سوارەکان شمشێر بێت بەلآم لەناو کالآندا.

لەم کاتەدا کە پێغەمبەر(د.خ) سەرقاڵی نووسینی پەیمانەکە بوو، ئەبوجەندەل کوڕی سوهەیل کوڕی عەمرۆ کوڕی یوسف بەستراو بەزنجیرێکی ئاسنین گەیشت کەبۆلای پێغەمبەر(د.خ) هەلآتبوو. هاوەلآنی پێغەمبەر(د.خ) گومانیان نەبوو سەرکەوتن بەدەست دێنن چوونکە پێغەمبەر(د.خ) لەمبارەوە خەوی بینیبوو. کاتێك ئاشتیان بینی، نیگەران بوون. کاتێك سوهەیل کوڕەکەی ئەبوجەندەلی بینی، ئەوی گرت و وتی: ئەی محەممەد پێش ئەوەی ئەم کوڕە بێتە لای تۆ، کاری من و تۆ تەواو بوو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ڕاستت کرد. ئەوی گرت تا بۆ قوڕەیشییەکانی بگەڕێنێتەوە. باوکی جەندەل هاواری کرد: ئەی موسوڵمانەکان، من بۆ لای بتپەرەستەکان دەگەڕێننەوە تا لەدینەکەم هەڵمگێڕنەوە. ئازار و ڕەنجی خەڵك زیادی کرد. پێغەمبەر(د.خ) پێی وتی: خۆڕاگر بە کەخوا بۆ تۆ و هاوەلآنی تۆ لەهەژاران، ڕێگە چارەیەك دەدۆزێتەوە. ئێمە پەیمانی خۆمان لەگەڵ ئەم خەڵکە بەست و ئێستا خیانەت لەپەیمانەکەی خۆمان ناکەین. دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب هەستا و هاورێ لەگەڵ باوکی جەندەل بەرێکەوت و بەردەوام پێی دەوت: خۆڕاگربە

و کاری خۆت بەخوا بسپێرە کەئەمانە بتپەرستەکانن و خوێنی هەرکامیان لەگەڵ خوێنی سەگدا بەرابەرە. ئەو دەسکی شمشێرەکەی لەباوکی جەندل نزیك دەکردەوە تا هەڵگیرێت و باوکی خۆی پێ بکوژێت. دەڵێت: کوڕ نەیتوانی باوکی خۆی بکوژێت.

هەندێك لەموسڵمانان شایەتیان بۆ ئاشتیدا و لەوان: ئەبوبەکر و عومەر و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف. هەروەها دەستەیەك لەبتپەرستەکان بەئاشتی رازی بوون.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەکارەکەی تەواو بوو، وتی: هەستن و قوربانییەکان بکوژن و ئەوسا سەر بتاشن. لەگەڵ ئەوەی چەندین جار ئەم قسەی دووبارە کردەوە، کەس لەشوێنەکەی هەڵنەستا. کاتێك کەس هەڵنەستا، ڕۆشتە لای هاوسەرەکەی خۆی دایکی سەلمە و ئەمەی بۆ گێڕایەوە. ژن وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بڕۆدەر و لەگەڵ هیچ کام لەوان قسە مەکە تا قوربانییەکانی خۆت سەر ببڕیت و سەرت بتاشی. ئەم کارەی کرد. کاتێك ئەمەیان بینی، هەستان و قوربانییەکانی خۆیان کوشت و سەریان تاشی بەڵام لەتاو خەم و ئازار دەیانویست یەکتر بکوژن. لەئیسلامدا پێش لەوە سەرکەوتنێکی گەورە بەدی نەدەکرا چوونکە خەڵك باوەڕیان بەیەکتر هەبوو و لەوساڵەدا، زیاتر لەهەموو ساڵەکانیتر خەڵك باوەڕی بەئیسلام هێنا.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەشتە مەدینە، باوکی بەسیر عوتبە کوڕی ئەسید کوڕی جارییەی سەقەفی موسوڵمان، هاتە لای. لەو کەسانە بوو لەمەککە زیندانی کرابوو. سەبارەت بەو ئەزهەر کوڕی عەبدی عەوف و ئەخنەس کوڕی شەریق نامەیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی و پیاوێك لەمناڵەکانی عامر کوڕی لۆئەییان لەگەڵ کۆیلەکەیان بەرێ کرد تا بیگەڕێننەوە. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: تۆ بێ گومان دەزانیت، ئێمە پەیمانمان بەم خەڵکە داوە و شکاندنی پەیمان لەئایینەکەی ئێمە ڕەوا نییە. ئەو تا زولحەلیفە لەگەڵ ئەوان ڕۆشت. لەوێ دانیشتن. باوکی بەسیر شمشێری یەکیان هەڵگرت و کوشتی و کۆیلەکە بەپەلە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و هەواڵی کوژرانی هاورێکەی خۆیدا. دواتر باوکی بەسیر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ لەسەر پەیمانەکەی خۆت پێبەند بوویت و خوا منی

رزگار کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: هاوار لەدایکی، داگیرسێنەری شەڕ ئەگەر چەندین پیاوی لەبەر دەستا بێت. کاتێك باوکی بەسیر ئەم قسەی بیست، زانی پێغەمبەر(د.خ) ئەو تەسلیمی قوڕەیشییەکان دەکاتەوە. ئەو ڕۆشت تا لەپانتاییەکانی زولمەروە لەقەراغ دەریا لەسەر ڕێگای قوڕەیشییەکان بۆ شام نیشتەجێ بوو و ئەو موسڵمانانەی لەمەککە زیندانی بوون، ئەم هەواڵەیان بیست و بەرەو لای باوکی بەسیر ڕۆشتن. یەك لەوان باوکی جەندەل بوو. لای ئەو نزیکەی هەفتا پیاو کۆبوونەوە. بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر کاروانی قوڕەیشییەکان. قوڕەیشییەکان پەیامیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد و بەخواوەندی خوا سوێندیاندا، هەرکەس بێتە لای ئەو، بابمێنێتەوە. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی پەنادا.

لەم ساڵەدا سوڕەی سەرکەوتن هاتەخوار.( کاتێك هاوکاری خواوەند و سەرکەوتن بگات. و خەڵکان ببینیت دەستە دەستە باوەڕ بەئایینی ئیسلام دێنن، سوپاسی خوا بکە و داوای لێخۆشبوونی لێبکە چوونکە ئەو بەخشەرە و میهرەبان(فتح/١١٠/١-٣). هەروەها دەستەیەك لەژنە خواپەرستەکان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) کۆچیان کرد لەناو ئەوان دایکی کولسوم کچی عوقبە کوڕی موعیەت. براکانی، وەلید و عەمارە هاتن تا بیگەڕێننەوە. خوا ئەم ئایەی نارد: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەخوا هێناوە، کاتێك ژنان وەك کۆچکەر دێنە لاتان، ئەوان تاقی بکەنەوە. خوا لەباوەڕیان ئاگادارترە. ئەگەر ئەوانتان بەباوەڕدار بینی، بۆ لای ناباوەڕان مەیانگێڕنەوە. نە ئەمان بۆ ئەوان ڕەوان و نە ئەوان بۆ ئەمان. ئەوەی ئەوان خەرجی ئەم ژنانەیان کردووە، بەوانی بدەن. ئەگەر بەهای ئەم ژنانە بدەن، هیچ گوناحێکتان لەسەر نییە ئەوان وەك هاوسەر هەڵبژێرن (ممتحنە/٦٠/١٠). لەوەدا هیچ ژنێکی خواپەرەست بۆ مەککە نەگەڕێندرایەوە. خوا ئەم ئایەی نارد: دەست لەگوارەی ژنانی خوا نەپەرەست مەدەن(ممتحنە/٦٠/١٠). بەدوای ئەوە عومەر کوڕی خەتاب دەستبەرداری دوو لەژنانی خۆی بوو، یەکیان دایکی کولسوم کوڕی عەمرۆ کوڕی جەروەلی خوزاعی و یەکیان قورەیبیە کچی ئەبی ئومەییە. ئەم دووانە بتپەرەست بوون. دایکی کولسوم بوو بەهاوسەری باوکی جەهم کوڕی حوزەیفە کوڕی غانم.

لەم ساڵەدا چەند شەڕێکی گەورە و بچوك (سریە و غەزوە) ڕوویدا.

لەوان شەڕی عوکاشە کوڕی میحسەن بوو کە لەگەڵ چل پیاوی شەڕکەر بۆ عەمەق ڕۆشت، خەڵکی ئەوێ پێشتر ئاگادار بوونەوە و ڕایان کرد. پێشەنگەکان بۆ پێشەوە غاریاندا ودووسەد وشتریان بینی، گرتیان و هێنایان بۆ مەدینە. ئەم شەڕە لەمانگی ڕەبیع الثانی / ئوتی٦٢٧ زایینی ڕوویدا.

شەڕێکیتر، شەڕی محەممەد کوڕی مەسلەمە بوو. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەمانگی ربیع ئەلئەوەل /ژوئیەی٦٢٧ زایینی لەگەڵ دەسوار ناردە شەڕی مناڵەکانی سەعلەبە کوڕی سەعد. ئەوان کەمینیان دانا تا خۆی و هاوەڵانیان خەوتن و ئەوسا هێرشیانکردە سەریان و هاوەڵانیان کوشت و ئەو بەتەنیایی وبریندار، ڕزگاری بوو.

هەروەها شەڕی باوکی عوبەیدە کوڕی جەراح لە زی قسە لەمانگی ربیع الثانی /ئەوتی ٦٢٧زایینی هاورێ لەگەڵ چل پیاوی شەڕکەر ڕوویدا. خەڵکی زی قسە لەبەرابەر ئەو هەڵاتن. ئەو پیاوێکی ئەسیر کرد و ژمارەیەك چوارپێی دەست کەوت. پیاوە ئەسیرەکە باوەڕی هێنا وپێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد.

هەروەها شەڕی زەید کوڕی حارسە لەپانتاییەکانی جەموم. ئەو ژنێکی بەناوی حەلیمە دەسگیر کرد کەئەوی بۆ شوێنێك لەشوێنەکانی مناڵەکانی سەلیم ڕێنوێنی کرد و سوپاکەی ژمارەیەکی زۆر چوارپێ و مەڕومالاتیان دەستکەوت و هەندێکیان بەئەسیری گرت کە هاوسەری ئەم ژنە لەناو ئەسیرەکاندا بوو. پێغەمبەر(د.خ) ئەم ژن و مێردەی ئازاد کرد.

شەڕێکیتری زەید کوڕی حارسە لەجمادی ئەلئەوەل/ سپتامبەری٦٢٧زایینی لەشوێنێك بەناوی عەیس ڕوویدا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەو سامانەی لەدەستی ئەبوئەلعاس کوڕی ڕەبیعدا بوو، وەرگیرا. ئەو پەنای بردەبەر زەینەب کچی پێغەمبەر(د.خ) و ئەم خاتونە پەنایدا کە لەشەڕی بەدەر ئاماژەمان پێدا.

لەناو ئەو شەڕانە، هەروەها شەڕی زەید کوڕی حارسە لەجمادی الثانی / ئۆکتۆبەری ٦٢٧ زایینی هاورێ لەگەڵ پانزە پیاوی شەڕکەر کەبەرەو سەرزەمینی مناڵەکانی سەعلەبە ڕۆشت دوژمن ڕێگەی هەلاتنی گرتەبەر. ئەو بیست وشتری

دەستکەوت.

شەڕێکیتری زەید کوڕی حارسە کەلە جمادی الثانی /ئۆکتۆبەر ٦٢٧ زایینی هێرشی کردە سەر حیسمی.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو رفاعە کوڕی زەیدی جوزامی زەببی لەکاتی ئاشتی حودەیبیە هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و کۆیلەیەکی بۆ پێغەمبەر هێنا کەباوەڕی هێنا. پێغەمبەر(د.خ) هاوڕێ لەگەڵ ئەو نامەیەکی بۆ خەڵکەکەی نووسی و ئەوانی بۆ سەر ئیسلام بانگێشتکرد کەباوەڕیان هێنا و دواتر بەرەو حەرەی رەجلا ڕۆشتنەدەر.

دواتر دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی لەشام لای سزار گەڕایەوە و کاتێك گەشتە سەرزەمینی جوزام، هونەید کوڕی عەوسی و کوڕەکەی عەوس کوڕی هونەیدی زولەیعی هێرشیانکردە سەر و هەرچی پێ بوو، لێیان سەند. ئەم هەواڵە گەشتە گوێی چەند کەسێك لەمناڵەکانی زوبەیب، لەخەڵکی رەفاعە کەموسڵمان بوون و ئەوان هێرشیانکردە سەر هونەید و کوڕەکەی و شەڕیان لەگەڵ کردن. مناڵەکانی زوبەیب سەرکەوتن وهەمووی ئەوەی لەدەحیە وەرگیرابوو، وەریانگرتەوە و بۆیان گەڕاندەوە. دەحیە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەم ڕووداوەی بۆ باسکرد و داوای خوێنی هونەید و کوڕەکەی عەوسی کرد. پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسەی بۆ ناردن ودەستەیەك پیاوی شەڕکەری کردە هاوڕێی. ئەمان لەفەزافز هێرشیانکردە سەر ئەو دووانە و هەموو سامانەکەیان کۆکردەوە و هونەید و کوڕەکەیان کوشت.

کاتێك مناڵەکانی زوبەیب (کەسەکانی رفاعە کوڕی زەید) ئەم هەواڵەیان بیست، هەندێك لەوان هاتنە لای زەید کوڕی حارسە و وتیان: ئێمە خەڵکانێکی موسڵمانین. زەید وتی: (ام الکتاب) (فاتیحە یەکەم سوڕەی قورئان) بخوێنن. حسان کوڕی ملە خوێندی. زەید وتی: لەناو سوپادا جاڕبدە: خواوەند ئەوەی لەرێگەی هاتووچۆی ئەم خەڵکە دەستکەوتووە، بەناڕەوا دەزانێت. ویستی ئەسیرەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە. یەکێك لەهاورێکانی ئاگاداری کردەوە لەم کارە دەبێت دوورئەندێشی بکات. زەید لەدانەوەی ئەسیرەکان خۆی دوورخستەوە و وتی: ئەوان لەژێر فەرمانی خوادان. نەیهێشت سوپاکەی بڕواتە ناو سەرزەمینی ئەم خەڵکە.

کاروانی جەزامی ڕۆشتە لای رفاعە کوڕی زەید لە(کوراع رەبە) کەلەم ڕووداوە ئاگادار نەبوون. یەك لەوان وتی: تۆلێرە لەژێر سێبەری مەڕەکان خەوتوویت و ئەوان دەدۆشیت و شیرەکەیان دەخۆیت و ژنانی جوزامی گرفتارن و فریوی ئەو نامەیان خواردووە کەتۆ هێناوتە. رفاعە لەگەڵ خەڵکەکەی ڕۆشتە مەدینە و نامەکەی بەپێغەمبەر(د.خ) نیشاندا. پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەگەڵ کوژراوەکان چی بکەم؟ وتیان: ئەوانەی زیندوون بۆ ئێمە بن و ئەوەی کوژراوە لەژێر پێی ئێمەدا بێت و خوێنی ئەومان ناوێت. پێغەمبەر(د.خ) بەداواکەیان ڕازی بوو و عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەگەڵ ئەوان بۆ لای زەید کوڕی حارسە نارد. سامانەی ئەم خەڵکە کەلێیان وەرگیرابوو، بۆیان گەڕایەوە. تا ئەو جێگەی ڕاخەری پەشمین یا موویینی ژنیان لەژێر کۆپانی چوارپێکان دەردەهێنا. ئەو ئەسیرەکانی ئازاد کرد.

هەروەها شەڕی زەید کوڕی حارسە لە وادی القری لەمانگی رەجەب ئەم ساڵە /نۆڤەمبەر ٦٢٧ زایینی ڕوویدا.

شەڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەشەعبان / دێسامبەر ٦٢٧ زایینی لەدومەئەلجەندەل ڕوویدا و خەڵکەکەی موسوڵمان بوون. عەبدولرەحمان لەگەڵ تومازۆر کچی ئەسبەغ سەرۆکەکەیان پەیوەندی هاوسەری بەست و ئەم ژنە بۆ ئەو کوڕەکەی، باوکی سەلمەی هێنایە دنیا.

هەروەها شەڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر لەمانگی شەعبان / دێسامبەر ٦٢٧ زایینی لەفەدەك ڕوویدا. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بیستی دەستەیەك لەمناڵەکانی سەعد بۆ دژایەتیکردن کۆبوونەتەوە و دەیانەوێت هاوکاری خەڵکی خەیبەر بکەن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت و چاوی بەدیدەوانێك لەوان کەوت. ئەو پیاوە بەعەلی وت ڕۆشتۆونەتە لای خەڵکی خەیبەر تاهاوکاری خۆیان پێشکەش بکەن و خەیبەریەکان لەبەرابەردا، خورمای خەیبەر بەم خەڵکە (مناڵەکانی سەعد) بدەن.

هەروەها شەڕی زەید کوڕی حارسە لەشوێنێك بەناوی (ام قرفە) لەمانگی رەمەزان / ژانویەی ٦٢٨ ڕوویدا. ئەو پیرێژنێکی بەتەمەن بوو. زەید کوڕی حارسە لەوادی القرا ڕووبەڕووی زەید کوڕی فەزارە بوویەوە و هاورێکانی کوژران و زەید کوڕی

حارسەیان لەناو کوژراوەکان هێنایەدەر. زەید کوڕی حارسە سوێندی خوارد دوای خەوتن لەگەڵ ژنەکەی سەروجەستەی بە ئاو نەشوات تا بڕواتە شەڕی مناڵەکانی فەزارە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد و ئەو لەوادی القرا ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئەوانی کوشت و گرفتاری کردن و ام قرفە یانی فاتمە کچی ڕەبیعە کوڕی بەدر کەپیرێژنێکی زۆر بەتەمەن بوو، لەگەڵ کچەکەی بەئەسیری گرت. کچەکەی بردە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەم کچە هی سەلمە کوڕی ئەکوەع بوو. پێغەمبەر(د.خ) وەك بەخشش لەوی گرت و بۆ لای حەرب کوڕی ئەبی وەهبی نارد کەعەبدوڵڵە کوڕی حەربی بۆ هێنایە دنیا.

بەڵام داستانی سەلمە کوڕی ئەکوەع بەمشێوە بوو: پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوبەکری بۆ فەرماندەیی ئەم شەڕە دیاری کرد. لەم سەلمە دەگێڕنەوە کەدەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ئەبوبەکری بۆ فەرماندەیی ئێمە دیاری کرد و ئێمە ڕۆشتینە شەڕی خەڵکانێك لەمناڵەکانی فەزارە و لەکاتی نوێژی بەرەبەیان هێرشمانکردە سەریان. من دەستەیەکم لەوان گرفتار کرد و بردمە لای ئەبوبەکر. لەناو ئەواندا ژنێك لەمناڵەکانی فەزارە لەگەڵ کچەکەی بوو کەبە جوانترین ژنی عەرەب لەقەڵەم دەدرا. ئەبوبەکر ئەم کچە نازەنینەی بەمن بەخشی. من گەڕامەوە بۆ مەدینە و لەبازار چاوم بەپێغەمبەر(د.خ) کەوت. وتی: ئەی باوکی سەلمە، خوا لەباوکت خۆش بێت، ئەم کچە بەمن ببەخشە. وتم: سوێند بەخوا خۆشم دەوێت و هێشتا جلم لەبەر دانەکەندووە. بەیانی دووبارە هەمان داوای لەمن کردەوە. من کچە جوانەکەم بەو بەخشی و پێغەمبەر(د.خ) ناردی بۆ مەککە و لەبەرابەر ئەو دەستەیەك لەئەسیرە موسوڵمانەکانی ئازاد کرد.

هەروەها شەڕی کورز کوڕی جابری فیهری لەعورینەیین بوو کەشوانەکەی پێغەمبەری کوشت. ئەوان وشترەکانیشیان بردبوو و ئەمە لەمانگی شەوال/فەوریەی٦٢٨ زایینی ڕوویدا. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەگەڵ بیست سوار ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ جەمیلە کچی سابت کوڕی ئەفلەح خوشکی عاسم پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەم ژنە عاسمی بۆ هێنایە دنیا.

عومەر ئازادی کرد و دوای ئەو یەزید کوڕی جاریە ئەوی کردە هاوسەری خۆی کە عەبدولرەحمان کوڕی زەیدی بۆ هێنایە دنیا. ئەمەیان لەدایکەوە برای عاسمە.

لەم ساڵەدا خەڵك بەسەختی گرفتاری وشکەساڵی بوون و پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی رەمەزان /ژانویەی ٦٢٨ زایینی لەگەڵ خەڵك نوێژی بارانی خوێند.

## نامە نوسینی پێغەمبەر(د.خ) بۆ پاشاکان

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) نێردراوەکانی هاوڕێ لەگەڵ نامەکانی خۆی بۆ لای خوسرەو و سزار و نەجاشی نارد. ئەو حاتەب کوڕی ئەبی بەلتەعەی بۆ لای مەقوقس ناردە میسر، شوجاع کوڕی وەهبی ئەسەدی ناردە لای حارس کوڕی ئەبی شیمری غەسانی، دەحیە بۆ لای سزار، سەلیت کوڕی عەمرۆی عامری ناردە لای هوزە کوڕی عەلی حەنەفی، عەبدوڵڵە کوڕی حوزافەی ناردە لای خوسرەو، عەمرۆ کوڕی ئومەییە زەمری ناردە لای نەجاشی و عەلا کوڕی حەزرەمی ناردە لای مونزەر کوڕی ساوی برای عەبدئەلقەیس. دەستەیەك دەڵێن: نامە نوسینی ئەو بۆ پاشاکان لەساڵی هەشتەمی کۆچی/ ٦٢٩ زایینی بوو.

مەقوقس نامەکەی پێغەمبەری وەرگرت و چوار کەنیزی وەك دیاری بۆ نارد کەیەکیان ماریە دایکی ئیبراهیم کوڕی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

سزار کەهەمان هراکلیوسە نامەکەی پێغەمبەری وەرگرت و خستیە نێوان ڕانەکانی خۆی. ئەو، بۆ پیاوێك کەنامە جۆراوجۆرەکانی دەخوێندەوە، نامەی نووسی و داوای لێکرد لە بارودۆخی پێغەمبەر(د.خ) ئاگاداری بکاتەوە. خوداوەندی رۆمیە بۆی نووسی: ئەمە هەمان پێغەمبەرە کە چاوەڕێمان دەکرد، بەراستگۆی بزانە وباوەڕی پێبێنە. هراکلیوس کەشیشیەکانی رۆمی لەدەسکەرە کۆکردەوە و درگاکانی بەست و چوونکە لەوان بۆ سەر گیانی خۆی دەترسا، لەسەرەوە لای ئەوان دەرکەوت و وتی: نامەی ئەو پیاوە بەدەستی من گەشتووە و داوا دەکات باوەڕی پێ بێنم. سوێند بەخوا ئەو بێ گومان هەمان پێغەمبەرە کە لەنووسراوەکانی خۆمان ئاماژەی پێدراوە. با بەراستگۆی دابنێین و باوەڕی پێ بێنین تا ئەم جیهانە و ئەو جیهانەمان لەدەستتا بمێنێت. کەشیشەکان وەك یەك

کەس لوورانـدیان وبـەرەو درگاکـان ڕۆشـتن تـا بڕۆنـەدەر. هراکلیـوس وتـی: ئـەوان بگەڕێننەوە. لەگیانی خۆی ترسا و وتی: ئەوەی پێم وتن وەك تاقیکردنەوە وابوو تا بزانم چەندە باوەڕتان بەدینەکەی خۆتان هەیە. من شتێکم بینی شادمانی کردم. کەشیـشەکان زەویـان مـاچ کـرد. لای ئـەوان ڕۆشـت و بەدەحیـەی وت: مـن دەزانم سـەروەری تـۆ پێغەمبـەریکی نێـردراوە بـەڵام لەڕۆمیـەکان دەترسـم و ئەگـەر ترسـی گیانم نەبوایە، باوەڕم پـێ دەهێنـا. ئێستا بڕۆ لای زەغاتر(ساکوتر) گەورە قەشـەی ڕۆمیەکان و باسی پێغەمبەرەکەتی بۆ بکە و بزانە چی دەڵێت.

دەحیە ڕۆشـتە لای وپەیامەکـەی پێغەمبـەری پێراگەیانـد. سـاکوتر وتـی: سـوێند بەخوا بێ گومان سەروەری تۆ پێغەمبەریکی نێردراوە کەئێمە بەتایبەتمەندییـەکانی دەیناسـینەوە و لەنووسـراوەکانی خۆمـان دەیبیـنین. ئـەو داردەسـتەکەی خـۆی هـەڵگرت و لەکەنیـسە ڕۆشـتە لای قەشـەکان و وتـی: ئـەی ڕۆمیـەکان، لەلایـەن ئەحمـەدەوە نامەیـەکمان بـۆ هـاتووە و داوا دەکـات بـاوەڕی پـێ بێـنین. مـن شـایەتی دەدەم خوایـەك جگـە لـەخوا نییـە و محەممـەد پێغەمبـەر(د.خ) و نێـردراوی ئـەوە. دەڵێت: هەموویان هێرشیان کردە سەری و خوێنیان ڕشت.

دەحیە بۆ لای هراکلیوس گەڕایەوە و ئەم هەواڵەی پێراگەیاند. هراکلیـوس وتـی: پێم وتی من لەگیانی خۆم لەدەست ڕۆمیـەکان دەترسـم. سزار بەڕۆمیـەکانی وت: بـا باجی پـێ بدەین. ئـەوان ڕازی نـەبوون. وتـی: سـەرزەمینی سـوریای پـێ دەدەیـن و بەئاشتی لەگـەڵی هەڵدەکـەین. ئـەوان ڕازی نـەبوون. هراکلیـوس ئەبوسـوفیانی بـانگ کـرد کەلـەم کاتـەدا سـەرقاڵی بازرگـانی کـردن بـوو لەشـام و ئـەو لـەڕۆژگاری ئاشـتی پێغەمبەر(د.خ) هاوپەیمانی بتپەرستەکانی مەککە بوو. هراکلیـوس قوڕەیشییەکانی لەپـشت سـەری خـۆی دانـا و ڕوویکـردە ئـەوان و وتـی: مـن چـەندین پرسـیاریان لێدەکـەم، ئەگـەر درۆی کـرد درۆکـانی ئاشـکرا بکـەن. ئەبوسـوفیان وتـی: ئەگـەر درۆ کردن بۆ من ناشیرین نەبوایە، درۆم دەکرد. ئەو سەبارەت بە پێغەمبەر(د.خ) پرسـی: ئەبوسـوفیان دەڵێـت: مـن کارەکـەی ئـەوم بەهیچ و کـەم بـایی لەقەڵەمدا. ئـەو گـوێی بەقـسەکەم نـەدا و وتـی: نـەژادی ئـەو لـەناو ئێـوەدا چـۆنە؟ وتم: لەباشـترینی خەڵکـەکانمان. وتـی: ئایـا لەبنەماڵەکـەی کـەس یـا کەسـانێك بـوون وەك ئـەو بتـوانن

قسە بکەن؟ وتم: نە. وتی: ئایا لای ئێوە پاشا و فەرمانڕەوا بووە و ئێوە لێتان سەندبێت؟ وتم: نە. وتی: کێ لەخەڵکی ئێوە باوەڕیان پێی هێناوە؟ وتم: هەژارەکان و ناتەوانان و گەنجەکان. وتم: ئایا کەسێك کەباوەڕی پێدێنێت، خۆشی دەوێت یا لێی ڕەم دەکات و بەدوژمنی دەزانێت ولێی جیا دەبێتەوە؟ وتم: هیچ کەس دوای باوەڕ هینان بەو لێی جیانەبۆتەوە. وتی: شەڕی ئەو لەگەڵ ئێوەدا چۆنە؟ وتم: جارجار سەردەکەوێت و جارجار ژێر. هەندێ کات ئەوسەردەکەوێت و هەندێ کات ئێمە. وتی: ئایا پەیمانشکێنی دەکات؟ دەڵێت: هیچم نەدۆزییەوە لەسەر پێغەمبەر(د.خ) وەك رەخنە بەکاری ببەم. وتم: نا. ئێستا لەگەڵ ئەودا بەئاشتی بەسەردەبەین و لەپەیمانشکاندنی ئەو ئاسودە نین. ئەو گرنگی بەم وتەیە نەدا.

ئەبوسوفیان دەڵێت: هراکلیوس پێی وتم: سەبارەت بەنەژادی ئەو پرسیارم لێکردی و وتت لەنەژادی خەڵکەکەی ئێمە و ڕەسەنترینیانە، پێغەمبەرەکان بەمشێوەن. لەتۆم پرسی ئایا لەبنەماڵەکەی کەسێك وەك ئەو قسەی کردووە یا نە، مەبەستەکەم ئەوەبوو ئەو خۆی وەك کەسەکانی خۆی لێکردبێت و تۆ وتت بەمشێوە نییە. پرسیم: ئایا پاشایەتی و فەرمانڕەوایی هەبووە و لێتان سەندبێت وئەم ئایینەی هێنابێت تاپاشایەتییەکەی بۆ بگەرێتەوە و تۆ وتت نە. سەبارەت بەشوێنکەوتووانی پرسیارم لێکردیت و تۆ وتت هەژاران و ناتەوانان و گەنجەکان. شوێنکەوتووانی پێغەمبەران ئەمانەن. لەتۆم پرسی ئایا شوێنکەوتووانی خۆشیان دەوێت یا لێی جیادەبنەوە و وتت ئەویان خۆش دەوێت و لێی جیانابنەوە. شیرینی باوەڕ لەوەدایە کاتێك بەدڵ گەیشت لێی نایەتەدەر. لەتۆم پرسی ئایا پەیمانشکێنی دەکات و تۆ وتت نایکات. ئەگەر راستیت لەگەڵە من وتبێت، بێگومان ئەو بەسەر ئەوەی لەژێر پێی مندایە زاڵ دەبێت. خۆزگە لای ئەو دەبووم و قاچەکانی ئەوم دەشۆرد. ئێستا بڕۆ و شوێن کارەکانی خۆت بکەوە.

دەڵێت: هاتمەدەر و دەستەکانم هەڵدەگلۆفی و وتم: ئەی بەندەکانی خوا، کاری کوڕی باوکی کەبشە بەرزبۆتەوە. ئێستا پاشاکانی رۆم لەدەرباری خۆیان ترسی ئەویان لەدڵدایە.

دەڵێت: دەحیە بەنامەکەی پێغەمبەر)ەوە هات کەئەمەی تیانوسرابوو.

بـەناوی خواوەنـدی بەخـشەندە و میهرەبـان. لەمحەممـەد پێغەمبـەری خـوا بـۆ هراکلیـوس گـەورەی رۆم. سـلاو لـەو کەسـەی شـوێن راسـتی و دروسـتی دەکـەوێت. باوەڕ بەخوا بێنە تا تەندروست بمێنیتەوە. باوەڕ بەخوا بێنە تادووجار پاداشت وەربگریـت. ئەگـەر بـاوەڕ نـەهێنیت، گونـاحی هـەموو گـەورەکان لەئەسـتۆی تۆدادەبێت.

بەلام حارس کوڕی شیمری غەسانی، نامەکەی پێغەمبەر لەسەردەستی شوجاع کوڕی وەهب پـێ گەیشت. کاتێك خوێندییەوە وتـی: ئێستا دەڕۆمـە شـەڕی ئـەو. کاتێك ئەم وتە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، وتی: پاشایەتییەکەی لەناوچوو.

بـەلام نەجاشـی کاتێك نامەکـەی پێغەمبـەری پـێ گەیـشت، بـاوەڕی پێـی هێنـا و لەسەردەسـتی جەعفـەر کـوڕی ئـەبی تالیـب بـاوەڕی هێنـا و کوڕەکـەی هـاوڕێ لەگـەڵ شەسـت کـەس لەحەبەشـیەکان بـۆ لای ئـەو نـارد کەهـەموویان لـەدەریادا خنکـان. پێغەمبەر(د.خ) پەیامی بۆنارد کەدایکی حەبیبە کچی ئەبوسوفیان بکاتـە هاوسـەری ئـەو. ئـەم ژنـە لەگـەڵ هاوسـەرەکەی عەبدوللـە کـوڕی جـەحش وەك کۆچـەرێکی موسوڵمان لەحەبەشە دەژیا کەمێردەکەی باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا و لەسەر ئەم ئایینە مرد. نەجاشی لەو بۆ پێغەمبەر(د.خ) خوازبێنی کرد و ئەو رازی بوو و نەجاشـی ئـەوی کـردە هاوسـەری پێغەمبـەر(د.خ) و چوارسـەد دینـاری وەك مـارەیی ئەو دانا. بەئەبوسوفیانیان وت: پێغەمبەر کچەکەی کردۆتە هاوسەری خۆی. وتـی: پیاوێکی نێرە کەخواستەکانی خۆی بەدی دێنێت و لەکەس ناترسێت(کچەکەمی بۆ ریسوایی من کردە هاوسەری خۆی و ناتوانم هیچ کارێك بکەم).

بەلام خوسرەو نامەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەسەردەستی عەبدوللە کوڕی حوزافە پێ گەیـشت. ئـەو نامەکـەی دڕانـد و پێغەمبـەر وتـی: پاشـایەتییەکەی لـەت لـەت بـوو. نامەکەی بەمشێوە بوو.

بـەناوی خواوەنـدی بەخـشەندە و میهرەبـان. لەمحەممـەد پێغەمبـەری خـوا بـۆ خوسرەو گەورەی ئێران. سـلاو لـەو کەسـەی شـوێن راسـتی و دروسـتی دەکـەوێت و باوەڕ بەخوا و نێردراوەکەی دێنێت و شایەتی دەدات جگە لـەخوا خوایـەك نییـە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە. من بانگەوازەکەی خۆم بەتۆ پێشنیار دەکەم. من

نێردراوی خوا بۆ لای هەموو خەڵکانم تا ئاگاداریان بکەمەوە (ئەو کەسەی دڵ زیندوو بێت و قسەی راست و ڕەوا بەسەر ناباوەڕان بسەپێنێت) (یس/٣٦/٧٠). باوەڕ بەخوا بێنە تا زیندوو بمێنیت. ئەگەر باوەڕ نەهێنیت گوناحی ئاگر پەرەستان لەئەستۆی تۆدایە.

کاتێك خوێندییەوە، دڕاندی و وتی: بۆ من بەمشێوە دەنوسێت لەکاتێکدا ئەو کۆیلەی منە! دواتر بۆ بازن کەنوێنەری ئەو بوو لەیەمەن نامەی نوسی: دوو پیاو بنێرە بۆ لای ئەم پیاوە حجازیە تا بیهێنن بۆ لای من. بازان دووپیاوی ڕەوانە کرد کەیەکیان (نابووە) بوو. نابووە پیاوێکی ژمێریار و نووسەر بوو. پیاوەکەی تر ئێرانی و پێیان دەوت خورە خوسرە. ئەو هاوڕێ لەگەڵ ئەم دووانە، نامەیەکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نوسی و فەرمانیدا لەگەڵ ئەم دووانە ڕەوانەی دەرباری خوسرەو بێت. ئەو نابووەی بانگ کرد و داوای لێکرد باس و خواسی پێغەمبەری بۆ بێنێت. قورەیشییەکان ئەم هەواڵەیان بیست، شادمان بوون و وتیان: مژدەتان لێ بێت، خوسرەو شای شاکان دژی وەستاوە. کاری ئەم پیاوە، کەسانیتر لەبەرژەوەندی ئێوە تەواوی دەکەن. ئەو دووانە ڕۆشتن تاگەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ریشیان تاشیبوو و سمێڵیان هێشتبوویەوە. پێغەمبەر(د.خ) حەزی نەدەکرد سەیری روخساری ئەو دووانە بکات و فەرمووی: هاوار لەئێوە، کێ فەرمانی پێداون ئاوا لەخۆتان بکەن؟ وتیان: خواوەندەکەمان یانی شای شاکانی ئێران. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵام خواوەند بەمنی فەرمووە ریش بهێڵمەوە و سمێل کورت بکەمەوە. ئەو دووانە ئاگاداریان کردەوە بۆ چ کارێك هاتوون. وتیان: ئەگەر خۆت بڕۆیتە لای شای ئێران، بازان لەبەرژەوەندی تۆ نامەیەك بۆ شای ئێران دەنوسێت تا بەنەرمی لەگەڵ تۆ هەڵسوکەوت بکات و ئەگەر نەڕۆیت، تۆ و خەڵکەکەت لەناو دەبات. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بڕۆن و بەیانی وەرنەوە. بۆ پێغەمبەر(د.خ) لەئاسمانەوە وەحی هات: خوا کوڕی خوسرەو(شیرویەی) بەسەر باوکیدا زاڵ کردووە و کوژراوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەو دووانەی بانگ کرد و ئاگاداری کردنەوە کەخوسرەو کوژراوە. بەو دووانەی وت: ئایین و فەرمانی من بەزووترین کات سەراسەری سەرزەمینی خوسرەو دەگرێتەوە تا ئەو شوێنەی سمی ئەسپ و هەنگاو ڕۆشتبێت، دەڕوات.

فەرمانی بەو دووانەدا بەبازان بڵێن باوەڕ بێنێت وئەگەر باوەڕ بێنێت ئەو وەك فەرمانڕەوایی یەمەن دەهێڵێتەوە و دەیکاتە پاشای خەڵکەکەی خۆی. دواتر ئەو بەخورە خوسرە پشتێنێکی زێرین و سیمینی بەخشی کەیەکێك لەپاشاکان بۆ پێغەمبەری ناردبوو.

ئەو دووانە گەڕانەوە بۆ لای بازان و بۆیان باس کرد. وتی: ئەم وتە، وتەی خەڵك نییە، من ئەو بە پێغەمبەر(د.خ) دەزانم. بێ گومان ئێمە چاوەڕێ دەبین، ئەگەر ئەوەی وتبێتی راست و دروست بێت، ئەو پێغەمبەری خوایە و ئەگەر نەبێت، خۆمان دەزانین چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین. بازان ماوەیەك چاوەڕوانی کرد تانامەی شیرویەی بەدەست گەیشت و ئاگاداری کردەوە کەباوکی خوسرەو بەهۆکاری تۆڵە سەندنەوە لەبەرژەوەندی ئێرانییەکان کوژراوە چوونکە ئەو گەورە و سەروەرانی ئەوانی کوشتبوو. شیرویە لەنامەکەی خۆی فەرمانی بەبازان دابوو، لەخەڵکی یەمەن پەیمان و سوێندی فەرمانبەری وەربگرێت و دەست لەپێغەمبەر(د.خ) هەڵگرێت. کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت، باوەڕی هێنا و لەگەڵ ئەو، ئێرانییە نیشتەجێبووەکانی یەمەن باوەڕیان هێنا. حەمیریەکان خورەخوسرە بەهەڵگری (معجزە) دەزانن. معجز لەزمانی ئەوان بەمانای پشتێنە.

بەڵام هوزە کوڕی عەلی، پاشای یەمامە، کاتێك سولەیت کوڕی عەمرۆ ڕۆشتە لای و ئەوی بۆ باوەڕ هێنان هاندا (ئەو مەسیحی بوو) نوێنەرانی خۆی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد کەموجاعە کوڕی موراره و رەجال کوڕی عونفوە لەناویاندا بوون. ئەو پەیامیدا ئەگەر فەرمانڕەوایی لەدوای خۆت بەمن ببەخشیت باوەڕ دێنم و هاوکاریت دەکەم و گەرنە شەڕت لەگەڵ دەکەم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: نا و ژیانی لێ تاڵ بێت، خوایە زیانەکەی لەمن دووربکەرەوە. زۆری نەخایاند، مرد.

رەجال و موجاعە باوەڕیان هێنا. رەجال لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە و سوڕەی بەقرە و زانستە ئایینییەکان فێربوو و گەڕایەوە بۆ یەمامە بەڵام لەئیسلام هەڵگەڕایەوە و شایەتیدا پێغەمبەر(د.خ) موسیلەمەی درۆزنی کردۆتە شەریك لەپێغەمبەرایەتی. ئەو کێشەیەکی گەورەتری لەموسەیلەمە دروست کرد.

بەڵام مونزەر کوڕی ساوی فەرمانڕەوای بەحرەین، کاتێك عەلا کوڕی حەزرەمی

ڕۆشتە لای و پێشنیاری ئیسلامی پێکرد کەیا باوەڕ بەم ئایینە بێنن یا باج بدەن، لەگەڵ هەموو عەرەبەکانی سەرزەمینەکەی باوەڕی بەئیسلام هێنا. بەحرەین لەم کاتەدا پارێزگایەکی گەورە لەپارێزگا پان و بەرینەکانی ئێران بوو.

بەڵام خەڵکەکانیتری بەحرەین وەك جوولەکە و مەسیحی و ئاگر پەرستەکان، لەگەڵ عەلا کوڕی حەزرەمی لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتیان بەست کەبۆ هەر ژن وپیاوێك یەك دینار بدەن. لەبەحرەین شەڕ ڕووی نەدا، هەندێك باوەڕیان هێنا و هەندێك پەیمانی ئاشتیان بەست.

لەم ساڵەدا ئاییینی حەج لەلایەن بتپەرستەکانەوە ئەنجام درا.

هەروەها لەم ساڵەدا دایکی ڕۆمان دایکی عایشە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی حەوتەمی کۆچی (٦٢٨-٦٢٩ زایینی)

### شەڕی خەیبەر

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەعومرەی حودەیبیە گەڕایەوە، مانگی زیحەججە و بەشێك لەموحەڕەمی/ ئاوریلی ٦٢٨ زایینی لەمەدینە بەسەر برد و ئەوسا لەگەڵ هەزار و چوارسەد پیاوی شەڕکەر و لەناویان دووسەد سوار، ڕووی کردە خەیبەر. ڕەوانەبوونی ئەو بۆ خەیبەر لەموحەڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچی /مەی ٦٢٨ زایینی بوو. سیباع کوڕی عورتەفەی وەك نوێنەری خۆی لەمەدینە دانا و بەڕێکەوت تا لەرەجیع لەگەڵ سوپاکەی خۆی دابەزی. مەبەستی لەم کارە ئەوە بوو جیایی بخاتە نێوان خەیبەرییەکان و هۆزی غەتەفان چوونکە غەتەفانییەکان پشتیوانی جوولەکەکان لەبەرابەر پێغەمبەر(د.خ) بوون. غەتەفانییەکان ئاهەنگی خەیبەریان کرد تا هاوکاری جوولەکەکان بکەن بەڵام ترسان موسوڵمانان لەسەر کەسان و سامانەکانی خۆیان بەجێبێڵن، لەبەر ئەمە گەڕانەوە و لەنێوان پێغەمبەر(د.خ) و جوولەکەکان دابەزین. ئەو لەرێگای خۆی بەعامر کوڕی ئەکوەع مامی سەلمە کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەکوەعی وت: بۆ وشترەکانی ئێمە گۆرانی بخوێنە. مەسیرە هات و ئەمەی خوێند:

| | |
|---|---|
| وللە لو لا اللە ما اهتدینا | و لا تصدقنا و لا صلینا |
| فانزلن سکینة علینا | و ثبت الاقدام ان لاقینا |

واتاکەی: سوێند بەخوا ئەگەر هاوکاری خوا نەدەبوو، رێگەی راستمان نەدەدۆزییەوە. زەکاتمان نەدەدا و نوێژمان نەدەخوێند. خوایە، ئارامیمان بۆ بنێرە و کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە، بەهێزمان بکە.

پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: خوا لێت خۆش بێت. ئەمەی بەهەر کەسێك دەوت لەرێگای خوادا دەکوژرا. عومەر کوڕی خەتاب پێی وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ بەم قسەیە ئێمەت بەرێز نەکرد! کاتێك موسوڵمانان گەشتنە خەیبەر و بۆ شەڕ وەستان، عامر لەنێوان دودۆڵ هاتەدەر و داوای شەڕکەری کرد بەڵام لەکاتی شەڕەکە

شمشێرەکەی خۆی گەڕایەوە و بەقورسی بریندار بوو و لەزیانی ئەو برینە مرد. خەڵك وتیان: خۆی کوشت. کوڕی براکەی سەلمە قسەکانی خەڵکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) باس کرد وئەو وتی: درۆ دەکەن. ئەو دووجار پاداشتی پێدەدەن. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەشتە بەرزاییەکان، بەهاوەڵانی خۆی وت: بوەستن. وتی: ئەی خوایە، ئەی خواوەندی ئاسمانەکان بەوەی سێبەریان بۆ دروست کرد و ئەی خوای زەوی و ئەو شتانەی لەژێریدایە، داوای باشی ئەم دێهاتە و باشی خەڵکەکەی لەتۆدەکەم و لەخراپی دێ و خراپی خەڵکەکەی پەنا بۆ تۆ دەبەم. هێرشبکەن بەناوی خوا. دەرۆشتە سەر هەر دێهاتێك ئەمەی دەوت.

شەوانە هێرشیکردە سەر خەیبەر بەشێوەیەك خەڵکەکەی ئاگادار نەبوونەوە. بەرەبەیان بەکەرەستەکانی کشتوکاڵی خۆیان هاتنەدەر و کاتێك ئەویان بینی، گەڕانەوە و وتیان: ئەوە محەممەد و سوپاکەیەتی! پێغەمبەر(د.خ) وتی: خوا گەورەیە، هەرکات لەهەر شوێنێك لەکەنار ماڵەکانی خەڵکێك دابەزین((بەرەبەیان ئاگادار کەرەوەی ئەوان لەناو دەچێت)(صافات/٣٧/١٧٧). ئەوانی گەمارۆدا و ژیانی لەوان تاڵ و دژوار کرد و دەستی بەسەر سامانی یەك یەکی ئەوان گرت و قەڵاکانی ئەوانی یەك لەدوای یەك کردەوە. یەکەم قەڵا کەگرتی، ناعیم بوو و لێرەدا بوو مەحمود کوڕی سەلمە کوژرا. بەردە ئاشێکیان پیا کێشا و دەستبەجێ گیانی سپارد. ئەوسا قەموس قەڵای مناڵەکانی حوقەیقی گرت. پێغەمبەر(د.خ) چەندین ئەسیری لەوان گرت کەیەکیان سەفیە کچی جەیی کوڕی ئەختەب ژنی کەنانە کوڕی رەبیع کوڕی باوکی حوقەیق بوو و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. دواتر ئەسیرەکانی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد. ئەوان دەستیان بەخواردنی گۆشتی کەرەکێویەماڵییەکان کرد بەڵام پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی لەم کارە دوورخستەوە.

لەم کاتەدا ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەنێوان زوبەیر و سابت ڕوویدا. چۆنیەتییەکەی ئەوەی زوبەیر کوڕی باتا قورەزی لەرۆژگاری جاهلی لەشەڕی بەعاس سابت کوڕی قەیس کوڕی شەماسی بەخشیبوو و ئازادی کردبوو، کاتێك کار گەشتە ئێرە، سابت هاتە لای زوبەیر و وتی: ئایا دەمناسیتەوە؟ زوبەیر وتی: ئایا وەك منێك کەسێکی

وەك تۆ ناناسێتەوە! سابت وتی: دەمەوێت پاداشتی بەخشینەکەی تۆ بدەمەوە. زوبەیر وتی: ڕێزدار کاری ڕێزدار بێ پاداشت ناهێڵێتەوە. سابت هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: زوبەیر جارێك منی بەخشیوە و دەمەوێت لەبەرابەر ئەو کارەی پاداشتی پێ بدەم، ئەو بەمن ببەخشە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەو بەخشی. سابت هاتە لای زوبەیر و وتی: پێغەمبەر(د.خ) خوێنی تۆی بەمن بەخشی، ئازاد بە. زوبەیر وتی: پیرەپیاوێکی بەتەمەنم کەژن و منالم نییە. سابت داوای بەخشینی ژن و منالەکانی ئەوی کرد و پێغەمبەر(د.خ) بەوی بەخشی. زوبەیر وتی: بنەماڵەیەك لەحیجاز بن و سامان و توێشویان نەبێت! سابت داوای لەپێغەمبەر(د.خ) کرد و پێغەمبەر(د.خ) سامانەکەی پێ بەخشی.

لێرەدا زوبەیر وتی: ئەی سابت، ئەو پیاوە چی بەسەرهات ڕوخساری وەك ئاوێنەیەکی درەوشاوە بوو کەکچانی دێ ڕوخساری خۆیان لەروخساری ئەودا دەبینی، کەعب کوڕی ئەسەد چی بەسەر هات؟ سابت وتی: کوژرا. زوبەیر وتی: ئەی چی بەسەر سەروەری شار و دێ حەیی کوڕی ئەختەب هات؟ سابت وتی: کوژرا. زوبەیر وتی: پێشەنگەکەمان لەکاتی هێرشبردن و پشتیوانەکەمان لەکاتی دووبارە هێرشکردن چییان بەسەر هات؟ عەزال کوڕی سەموال دەڵێم. سابت وتی: کوژرا. زوبەیر وتی: کەعب کوڕی قورەیزە و منالەکانی عەمرۆ کوڕی قورەیزە چییان بەسەرهات؟ سابت وتی: لەناوچوون. زوبەیر وتی: ئەی سابت، سوێندت دەدەم بەو بەخشینەی بەتۆم بەخشی من بگەیینە بەوان چوونکە سوێند بەخوا ژیان دوای ئەوان سودی نییە. سابت ئەوی کوشت.

ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) قەڵای سەختی گرت کەزیاتر لەهەمووان ڕۆن و خواردنی تیابوو. دواتر مەبەستی قەڵاکانی وەتیح و سولالمی کرد و ئەمانە دووایین قەڵا بوون بەدەستیان بەسەرداگیرا. لەم قەڵایە، مەرحەبی جوولەکە هاتەدەر کەبەردەوام دەیخوێند:

قد علمت خيبر انى مرحب — شاكى السلاح بطل مجرب

اطعن احيانا و حينا اضرب — اذا الليوث اقبلت تلهب

كان حماى كالحمى لا يقرب

واتاکەی: خەیبەرییەکان دەزانن من مەرحەبم. سەراسەر داپۆشرا بەکەرەستەی شەڕ و پاڵەوانێکی بەئەزموونم. هەندێکات بەڕم و هەندێکات بەشمشێر شەڕ دەکەم. ئەمە لەکاتێکدایە شمشێری شەڕ بەردەوام ببارێت. لەم کاتەدا شوێنەکەی من وەك پارێزگایەك وابێت کەس نەتوانێت هێرشبکاتە دەورووبەرەکەی.

ئەو داوای شەڕکەری کرد. محەممەد کوڕی موسلیمە ڕۆشت ڕووبەڕووی ببێتەوە و وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەر(د.خ) من داغداری شۆڕشگێڕم چوونکە براکەمیان دوێنێ کوشت. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ شەڕی ئەو نارد و فەرمووی: خوایە ئەو بەسەر ئەودا زاڵ بکە. محەممەد کوڕی موسلیمە ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕ لەنێوان ئەوان درێژەی کێشا و سەئەنجام مەرحەب بەشمشێر لەمحەممەدیدا و ئەم بەقەڵغانە چەرمینەکەی لەخۆی دووری خستەوە. شمشێر لەقەڵغانەکە چەقی و گیری کرد. محەممەد کوڕی موسلیمە بەشێوەیەك لێیدا دەستبەجێ کوشتی. دوای ئەو براکەی یاسر هات و وتی:

قد علمت خيبر انى ياسر          شاكى السلاح بطل مغاور

واتاکەی: خەیبەرییەکان بەباشی دەزانن من یاسرم. داپۆشراو بەکەرەستەی شەڕ و پاڵەوانێکی هێرشبەر.

ئەو داوای شەڕکەری کرد: زوبەیر کوڕی عەوام ڕووبەڕووی بوویەوە وکوشتی.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی مەرحەبی خەیبەری کوشت و قەڵاکەی گرت، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. ئەم قسە ڕاستتر و بەناوبانگترە.

بورەیدە ئەسلەمی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) هەندێ کات ژانەسەر دەیگرت وکاتێك ئەم ئازارەی پێدەبڕا یەك یا دوو ڕۆژ لەخێوەتەکەی نەدەهاتەدەر. کاتێك هاتەخەیبەر، دووبارە ژانەسەری گرت و نەهاتە لای خەڵك. ئەبوبەکر ئاڵاکەی لەپێغەمبەر(د.خ) وەرگرت هەستا و شەڕی کرد و گەڕایەوە و دواتر عومەر ئاڵاکەی وەرگرت و شەڕێکی قورستری لەئەبوبەکر کرد و گەڕایەوە. ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت، وتی: سوێند بەخوا، بەیانی ئاڵاکە دەدەمە دەست کەسێك کەپێغەمبەری خۆش دەوێت و خوا و پێغەمبەرەکەی ئەویان خۆش دەوێت

و ئەو قەڵاکان بەزۆری شمشێر و بازوی خۆی دەگرێت. عەلی لەوێ نەبوو. ئەو ئازاری چاوی هەبوو و لەبەر ئەمە لەمەدینە مایەوە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەم قسەی کرد، قورەیشییەکان بۆ بەدەست هێنانی ئەم پێگەیە هەوڵیاندا و لەگەڵ یەك گفتوگۆیان کرد کەبڵێی ئەم پیاوە بەختەوەرە کێ بێت. بەرەبەیان عەلی سوار لەسەر وشترەکەی خۆی گەیشت و لەنزیك خێوەتەکەی پێغەمبەر(د.خ)خەواندی و هێشتا چاوی ئازاری بوو وبەدەسماڵ بەستبووی. پێغەمبەر(د.خ) وتی: تۆ چ ئازارێکت هەیە؟ عەلی وتی: دوای تۆ ئازاری چاوم گرت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەمن نزیك بەرەوە. عەلی نزیك بوویەوە و پێغەمبەر(د.خ) ئاوی دەمی خۆی لەچاوەکانی سوو و دوای ئەوە عەلی تا ئەو کاتەی زیندوو بوو، لەئازاری چاو گلەیی نەکرد. ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) ئالاکەی دایەدەست عەلی. عەلی ئالاکەی هەڵگرت و جلێکی سوری پۆشی و لەخەیبەر نزیك کەوتەوە. پیاوێك لەجوولەکەکان لەسەرەوە سەیری کرد و وتی: کێیت؟ وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب. جوولەکە وتی: ئەی یەهودییەکان، شکەستتان خوارد. مەرحەب، خواوەندی ئەو قەڵایە هاتەدەر و خودەیەکی یەمانی لەسەر کردبوو کەلە هێلکەیەکی لەنێوە براو دەچوو. دەیوت:

قد علمت خيبر انی مرحب     شاکی السلاح بطل مجرب

واتاکەی: خەیبەرییەکان دەزانن من مەرحەبم. پۆشراو بەئاسن و پاڵەوانێکی بەئەزموونم.

عەلی وتی:

انا الذی سمتنی امی حیدره     اکیلکم بالسیف کیل السندره

لیث بغابات شدید قسوره

واتاکەی: من ئەوەم دایکم ناوی شێری ژیانی لێ ناوم. بەپەیمانەیەکی زۆر گەورە شمشێر بەڕووی ئێوەدا دەکێشم. شێری دارستانێکی خەوتووم و پڵنگێک بەچنگ و ددان.

ئەوان دووجار بەشمشێر لەیەکیاندا و عەلی بەشێوەیەك لێیدا، قەڵغانە چەرمین و

خودەکەی ئەوی قەڵشاند و سەری کەوتە سەر زەوی. شار بەمشێوەیە دەستی بەسەردا گیرا.

باوکی رافع کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) عەلی بەئاڵاکەی خۆی رەوانەی خەیبەر کرد، لەگەڵ عەلی ڕۆشتمەدەر. کاتێك لەقەڵاکە نزیك کەوتەوە، کەسەکانی قەڵاکە بۆ شەڕی ئەو هاتنەدەر و پیاوێك لەیەهودییەکان لەعەلیدا و قەڵغان لەدەستی کەوتەخوار، عەلی دەرگایەك کەلەنزیکی قەڵاکەبوو، هەڵی گرت و کردییە قەڵغانی خۆی. درگاکە لەدەستیدابوو و ئەو شەڕی دەکرد تا خوا قەڵاکەی لەسەر دەستی ئەو کردەوە. ئەوسا دەرگاکەی فڕێدا. من و حەوت کەسی تر، رۆشتین دەرگاکە هەڵگرین و نەمانتوانی. گرتنی ئەم قەڵایە لەمانگی سەفەر/ژوئەنی ٦٢٨ زایینی بوو.

کاتێك خەیبەر دەستی بەسەردا گیرا، بیلال، سەفیەی لەگەڵ ژنێکیتر هێنا و ئەوانی لای کوژراوە جوولەکەکان تێپەڕاند.

کاتێك ئەو ژنە کوژاروەکانی بینی، دەیقیژاند و ڕوخساری خۆی دەڕنی و خۆڵی دەکرد بەسەری خۆیدا. پێغەمبەر(د.خ) سەفیەیی بۆ خۆی هەڵبژارد و ئەو ژنەیتری دوورخستەوە، وتی: ئەو بەم کارانەی بوو بەهاوشێوەی شەیتان. بەبیلالی فەرموو: ئایا مێهرەبانی لەدڵتا نەمابوو، ئەم دوو ژنەت بۆ سەیر کردنی کوژراوەکان هێنا!

ئەوکاتەی سەفیە بووکی کەنانە کوڕی باوکی حەقیق بوو، شەوێك لەخەودا بینی، مانگ کەوتۆتە داوێنی. ئەو خەوەکەی بۆ هاوسەرەکەی گێڕایەوە. هاوسەرەکەی وتی: تەنیا بۆ ئەوە ئەو خەوت بینیوە کە ئارەزو دەکەیت لەباوەشی محەممەد بخەویت. شەقەزللەیەکی لەروخساری نازەنینیدا و چاوی شین و مۆر کرد. کاتێك ئەویان هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ)، هێشتا چاوە جوانەکانی شین بوو. پێغەمبەر(د.خ) پرسی: چیت بەسەر هاتووە و ژن بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) کەنانە کوڕی باوکی حەقیقی تەسلیمی محەممەد کوڕی موسلیمەدا تا لەبەرابەر کوژرانی براکەی بیکوژێت.

پێغەمبەر(د.خ) دوقەڵای وەتیح و سەلالمی بەدژواری گرت. چوونکە خەڵکەکەی بێ گومان دەیانزانی لەناو دەچن، داوایان لێکرد لەخوێنی ئەوان خۆش بێت و

ئەوان لەو سەرزەمینە دوور بکاتەوە. پێغەمبەر(د.خ) رازیبوو. ئەو دەستی بەسەر سامانەکەی ئەواندا گرت و (شق) و (نگاە) و(کتیبە) ی لەگەڵ هەموو قەلاکانی ئەوان گرت.

کاتێك خەڵکی فەدەك ئەمەیان بیست، پەیك و پەیامیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد تا ئەوان لەسەرزەمینەکەیان دووربخاتەوە و دەست بەسەر سامانەکەیاندا بگرێت. پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو. کاتێك خەیبەرییەکان بەمەیان زانی، داوایان لەپێغەمبەر(د.خ) کرد سامانەکانی ئەوان نیوبەنیو لەگەڵ ئەوان دابەش بکات و هەرکات بیەوێت، ئەوان لەوێ دووربکاتەوە. ئەو لەگەڵ ئەوان پەیمانی بەست هەموو کاروباری تایبەت بەکشتوکاڵ کردن و ئاودان ئەنجام بدەن و بەهەمان شێوە کەداوایان کردبوو، بەشیان بەرکەوێت. خەڵکی فەدەکیش ئەم کارەیان کرد. خەیبەر بەشی موسوڵمانان و فەدەك تایبەت بوو بەپێغەمبەر(د.خ) چوونکە هیچ سوارە و پیادەیەکی موسوڵمانان نەگەشتە ئەوێ. کاتێك پێغەمبەری خوا ئارامی گرت، زێنەب کچی حارس ژنی سەلام کوڕی مشکەم، بەرخێکی برژاوی ژەهر لێدراوی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هێنا. پێغەمبەر(د.خ) لەتێکی لێهەڵگرت و گازی لێگرت بەڵام قوتی نەدا. بشر کوڕی بەرا کوڕی مەعرور لێی خوارد و پێغەمبەر(د.خ) کە بەناخۆشی بینی، وتی: ئەم مەڕە پێم دەڵێت ژەهراوییە. ئەوسا ژنەکەی بانگ کرد و ئەو دانی بەهەموو شتێکدانا. پێغەمبەر(د.خ) وتی: چ هۆکارێك بۆ ئەم کارە تۆی هاندا؟ ژن وتی: بەڵایەکەت بەسەر خەڵکەکەم هێنا لای خۆت ئاشکرایە. بەخۆم وت: ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) بێت ئاگادار دەبێت و ئەگەر پاشا بێت، لەزیانی تۆ رزگارمان دەبێت. بوشر بەژەهری ئەو خواردنە گیانی سپارد.

پێغەمبەر(د.خ) لەدوایین نەخۆشی خۆی لەسەرەمەرگا وتی: دەبینم بڕبڕەی پشتم لەژەهری خواردنەکەی خەیبەر لێك پچڕاوە. موسوڵمانان باوەڕیان وایە ئەو جیاواز لەوەی پێغەمبەری خوایە، شەهیدی ڕێگەی خوایشە.

## شەڕی وادی ئەلقورا

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی خەیبەر تەواو بوو، بەرەو وادی ئەلقوڕا ڕۆشت و خەڵکەکەی بۆ ماوەی چەندین شەو و ڕۆژ گەمارۆدا و بەزۆر ئەوێی گرت. لەم شەڕەدا، مێدغەم کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) کەروفاعە کوڕی زەیدی جوزامی پێی بەخشیبوو، کوژرا. موسوڵمانەکان وتیان، بەهەشت جێگەی بێت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرگیز، سوێند بەو کەسەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، هەمێستاکە ئەو ڕۆپۆشەی لەخۆی ئاڵاندبووی، لەئاگری جەهەننەم بڵێسە دەسەنێت. ئەو ئەم ڕۆپۆشەی لەکاتی دابەش کردنی تاڵانییەکانی خەیبەر دزی. پیاوێك ئەم قسەی بیست و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ دوو جوت پێڵاو کەبەر من کەوت، دووجوت قەیتانم دزی. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەدرێژایی قەیتانەکان لەئاگری جەهەننەم جیادەکەنەوە و بەقاچتیەوە دەبەستن.

پێغەمبەر(د.خ) دارخورماکان و زەوییەکانی ئەو ناوچەی لەدەست خەڵکەکەیدا هێشتەوە و لەسەر هەمان پەیمان لەگەڵیان ڕێککەوت کەلەگەڵ خەیبەرییەکان ڕێکەوتبوو. ئەوان تارۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب لەسەر ئەم پەیمانە بەردەوام بوون و کاتێك ئەو کاروبارەکانی گرتەدەست، ئەوانی لەوێ دەکرد. دەستەیەك دەڵێن: عومەر ئەوانی دەرنەکرد چوونکە ئەم سەرزەمینە لەدەرەوەی حیجاز بوو.

لەم سەفەرەدا یانی خەیبەر، پێغەمبەر(د.خ) لەنوێژی بەرەبەیان خەوی لێکەوت تا خۆر ئاوابوو. ئەم داستانە زۆر بەناوبانگە.

لەم شەڕەدا چەند لەخاتونە موسوڵمانەکان هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەو لەتاڵانییەکان بەشی بۆ دیاری کردن وپێی بەخشین.

## داستانی حەجاج کوڕی عیلاتی سولەمی

لـەم سـەفەرەدا حـەجاج کـوڕی عیلاتـی سـولەمی بەپێغەمبـەری وت: مـن لای هاوسەرکەم شیبە کچی باوکی تەلحە سامانێکی زۆرم هەیە. ئەو دایکی کوڕەکەی موعریز کـوڕی حـەجاج بـوو. وتـی: مـن سـامانێکی بـەربڵاوم لەمەککـە هەیـە. ئـەی پێغەمبـەر(د.خ) دەسـتورێك بـدە تـا بڕۆم و بیهێـنم. پێغەمبـەر(د.خ) دەسـتوری پێـدا. حـەجاج وتـی: پێویـستم بەدەستورێکە بتوانم بەئازادی قسە بکەم. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: بـەئازادی قسە بکـە. حـەجاج ڕۆشـتە مەککـە. خـەڵکانی مەککـە لـەو سەبارەت بەپێغەمبـەر(د.خ) پرسـیاریان کـرد کەچـی لەگـەڵ خەیبەرییـەکان کـردووە؟ هێـشتا نەیاندەزانی ئەو باوەڕی هێناوە. وتی: جوولەکەکان ئەویان شـکاند و هاوەڵەکانیان بەسـەختی کوشـتار کـرد و محەممـەد خـۆی گرفتـار بـوو. جوولەکـەکان وتیـان: نایکوژین بەڵکو دەینرێین بۆ مەککە تا ئەوان بیکوژین. ئەم هەواڵەیان بەدەنگی بـەرز لەمەککەدا جاڕدا. حەجاج وتی: یارمـەتیم بدەن تـا سـامانەکەم کۆبکەمـەوە و بڕۆمـە خەیبەر و لەسامانە بەربڵاوەکانی محەممەد و هـاوەڵانی ئاڵوگۆڕ بکـەم پـێش ئـەوەی بازرگانەکان بگەنە ئەوێ. سامانەکەی ئەویان بەخێرایی هەرچی زیـاتر کۆکردەوە و پێیان سپارد. عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب هاتە لای و پرسیاری بارودۆخی لێکرد و ئەمە دوای ئەوە بوو کەئەو سامانەکەی خۆی وەرگرتبوویەوە. ئەو بەعەباسـی وت کە قەڵاکانی خەیبـەر دەستیان بەسەردا گیراوە و پێغەمبەر(د.خ) سەفیە کوڕی حەیی بۆ خۆی دیاریکردووە. حەجاج داوای لەعەباس کرد ئەم هەواڵە تا سێ ڕۆژ بەنهێنی بهێڵێتەوە نەك خەڵکانی مەککە شوێنی کەون. عـەباس دوای ڕۆشـتنی ئـەو سـێ ڕۆژ ئەم بابەتـەی بـەنهێنی هێشتەوە و دواتـر جلوبـەرگی تـازەی لەبـەر کرد و هاتـەدەر و بـەدەوری کەعبـەدا سـوڕا. کاتێـك قوڕەیـشیکان ئـەویان بـینی، وتیـان: ئـەی ئەبوئەلفەزل، سوێند بـەخوا لـەم کـارەی تـۆ خۆنوانـدنێکی بـەئازارە. وتـی: هـەرگیز! محەممەد دەستی بەسـەر خەیبـەردا گـرت. کچی پاشا و سـامانەکانی ئەوانیـشی بـۆ خـۆی هـەڵگرت. ئـەو بەسـەرهاتەکەی حـەجاجی بـۆ بـاس کـردن. خـەڵکانی مەککـە وتیان: ئەگەر دەمانزانی بەشێوەیەکیتر لەگەڵ ئەو هەڵسوکەوتمان دەکرد.

## دابەش کردنی سامانی خەیبەر

لـەناو سـامانەکانی خەیبـەر (شـق) و (نگـاه)ی لـەناو موسـڵمانەکان دابـەش کـرد. کەتیبـە پێـنج لەسـەر یـەك و تایبـەت بـەخوا و پێغەمبـەر(د.خ) و کەسـەکانی و هەتیوەکان و هەژارەکان و رێبواران بوو. بەهاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) بەشێك دەدرا و بەوکەسـانەی لـەنێوان پێغەمبـەر(د.خ) و فەدەکییـەکان هاتووچـۆیان دەکـرد تـا بنـەماکانی ئاشـتی سـەقامیگر بکـەن. خەیبـەریان لـەناو ئامـادەبووانی حودەیبیـە دابـەش کـرد و سـوارە دووبەشـی بەرکـەوت و پیـادە یـەك بـەش. پێغەمبـەر(د.خ) خەیبەرییەکان لەخەیبـەر راگرت و ئەبوبـەکر ئەم کارەی کرد و عومـەر لەسـەرەتایی فەرمانڕەوایی خۆی لەسەر ئەم شێوە بەردەوام بوو تا پێیانراگەیاند پێغەمبـەر(د.خ) لەنەخۆشـی مـەرگی خـۆی فەرموویـەتی: لەدوورگـەی عـەرەبی دوو ئـایین پێکـەوە هەڵناکـەن. لەبـەر ئەمـە عومـەر ئـەو جوولەکانـەی هـیچ پـەیمانێکیان لەگـەڵ پێغەمبەر(د.خ) نەبەستبوو، دەرکرد.

## داستانی فەدەك

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەر گەڕایەوە، موحەیسە کوڕی مەسعودی نـاردە لای خەڵکی فەدەك و ئەوانی بۆ سەر ئیسلام بانگ کرد. رێبەرەکەیان لـەم کاتـەدا یوشـەع کـوڕی نـونی یـەهودی بـوو. ئـەوان لەسـەر بنـەمای نیـوەی زەوییەکـەیان لەگـەڵ پێغەمبـەر(د.خ) پـەیمانی ئاشـتیان بەسـتبوو. نیـوەی فـەدەك تایبـەت بـوو بەپێغەمبـەر(د.خ) چوونکە موسـڵمانەکان هـیچ سـوارە وپیادەیـەکیان نەگەشـتبووە ئەویَ. داهاتێك کە لەفەدەکەوە بەپێغەمبەر(د.خ) دەگەیشت، بەسەر رێبواران دابـەش دەکـرا. کـاری خەڵکەکـەی بەمـشێوە بـوو تـا عومـەر کـوڕی خـەتاب هاتەسـەرکار و جوولەکـەکانی حجـازی بـانگ کـرد. بـاوکی هەیسەم کـوڕی تـەیهان و سـەهل کـوڕی خەیـسەمە و زەیـد کـوڕی سـابتی نـارد تـا بەشـێوەیەکی دادپەروەرانـە بـەها لەسـەر نیوەی زەوییـەکانیان دابنـێن. ئـەو بەهاکـەی بەجوولەکەکانـدا و ئـەوانی بـەرەو شـام

نـــارد. پێغەمبـــەر(د.خ) و ئەبوبـــەکر و عومـــەر و عوسمـــان و عـــەلی بەشـــێوەی پێغەمبەر(د.خ) هەڵسوکەوتیان دەکرد.

کاتێك معاویـە هاتەسـەرکار، فـەدەکی بەخـشی بەمـەروان کـوڕی حەکـەم. مـەروان دای بـەدوو کوڕەکـەی عەبدولموتـەلیب و عەبدولعـەزیز. دواتـر فـەدەك کەوتـە دەسـت عومـەر کـوڕی عەبدولعـەزیز و وەلید و سـلێمان کـوڕی عەبدولمـەلیك کـوڕی مـەروان. کاتێك وەلیـد بـوو بەخـەلیفە، بەشـی خـۆی لەفەدەکـدا بەعومـەر کـوڕی عەبدولعـەزیز. دواتـر سـلێمان کـوڕی عەبدولمـەلیك هاتەسـەرکار و ئـەویش بەشـی خـۆی لەفەدەکدا بەعومـەر کـوڕی عەبدولعـەزیز. کاتێـك عومـەر کـوڕی عەبدولعـەزیز بـوو بەخـەلیفە، بـۆ خـەڵك وتاریـدا و ئـەوانی لەداسـتانی فـەدەك ئاگـادار کـردەوە و وتـی بەشـێوەی پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی مامڵە لەگـەڵ فـەدەك دەکات. ئـەو فـەدەکی سـپاردە دەسـتی منداڵـەکانی فاتمـە کـچی پێغەمبـەر(د.خ). دووبـارە فەدەکیان لیَ سەندرایەوە.

لەسـاڵی دووسـەد و دەی کـۆچـی / ٨٢٥ زایـینی، مـەئمون دووبـارە فـەدەکی گەڕاندەوە بۆ منداڵەکانی فاتیمە کچی پێغەمبەر(د.خ) .

## ڕووداوەکانی تری ئەم ساڵە

لـەم سـاڵەدا پێغەمبـەر(د.خ) زێنـەبی کـچی کـردە هاوسـەری بـاوکی عـاس کـوڕی ڕەبیع. ئەم هاوسەرگیرییە لەمانگی موحەرەم /مەی ٦٢٨ زایینی ڕوویدا.

لەمساڵەدا حاتب لای مەقوقس گەڕایەوە و ماریەی جوان ڕوخسار دایکی ئیبراهی کوڕی پێغەمبـەر(د.خ) و خوشـکەکەی و ئێسترەکەی دولـدول وکەرەکـەی یـەعفور و جل وبەرگێکی گرانبایی بۆ پێغەمبەر(د.خ) بەدیاری هێنا. ماریەی جوان ڕوخسار و خوشکەکەی شیرین پێش هاتن بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) باوەڕیان بەئیسلام هێنا. ئەو ماریـەی بـۆ خـۆی هـەڵگرت و شـیرینی بەخـشی بەحـسان کـوڕی سـابتی ئەنـساری کەعەبدولرەحمانی بۆ هێنایە دنیا. ئەو کوڕە پوری ئیبراهیم بوو.

لەمساڵەدا پێغەمبـەر(د.خ) بـۆ خـۆی مینبـەری دانا. دەستەیەك دەڵێن مینبـەریان

لەساڵی هەشتەم/٦٢٩ بۆ دروست کرد.

لەمساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عومەر کوڕی خەتابی لەگەڵ سی پیاوی شەڕکەر ناردە (عجز هوازین). خەڵك لەبەرابەری ڕایان کرد و ئەو ڕووبەڕووی هیچ کێشەیەك نەبوویەوە.

لەم ساڵەدا لەشەعبان / دێسامبەر ٦٢٨ بەشیر کوڕی سەعد باوکی نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری لەگەڵە سی پیاوی شەڕکەر ڕەوانەی شەڕی مناڵەکانی مورە لەفەدەك کرا. هاوەڵانی کوژران و ئەو برینـدار و نیوە گیان لەناو کوژراوان دۆزرایەوە. دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا غالب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی بۆ شەڕ لەسەرزەمینی مناڵەکانی مورە ڕۆشتەدەر و میرادس کوڕی نەهیك هاوپەیمانی ئەوان لەجوهەینەی گەمارۆدا. ئوسامە کوڕی زەید و پیاوێك لەئەنسار پەلاماریاندا و بەئەشکەنجە کوشتیان. ئوسامە دەڵێت: کاتێك ئەومان گرت، وتی: شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوا نییە. ئێمە دەستمان لێهەڵنەگرت تا کوشتمان. کاتێك گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و بۆمان باسکرد، وتی: لەگەڵ (خوایەك جگە لەخوا نییە) چی دەکەن!

هەروەها لەم ساڵەدا غالب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی هاوڕێ لەگەڵ سەد و سی سوارە ڕەوانەی شەڕی عەبد کوڕی سەعلەبە بوو و هێرشی کردە سەر ئەوان و وشتر و مەڕوماڵاتەکەی ئەوانی گرت و هێنای بۆ مەدینە.

لەم ساڵەدا شەڕی بەشیر کوڕی سەعد لەگەڵ یۆمن و جەناب ڕوویدا و ئەم شەڕە لەمانگی شەوال /فەوریەی ٦٢٩ زایینی بوو.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوەبوو جوبەیل کوڕی نویرەی ئەشجەعی ڕێنیشاندەری پێغەمبەر(د.خ) بۆ خەیبەر، هاتە لای و ئاگاداری کردەوە دەستەیەك لەغەتەفانییەکان لەلایەن عۆیەینە کوڕی حسن هاوکاری کراون تا هێرشبکەنە سەر مەدینە. پێغەمبەر(د.خ) بەشیر کوڕی سەعدی هاوڕێ لەگەڵ پیاوە شەڕکەرەکان ڕەوانە کرد کەژمارەیەك چوارپێیان بەدەست هێنا و یەکێك لەکۆیلەکانی عۆیەینەیان کوشت و دواتر ڕووبەڕووی دەستەی عۆیەینە بوونەوە و ئەوانیان کوشتار کرد و

عۆیەینە هەڵات. حارس کوڕی عەوف ئەوی تێکشکاند و پێی وت: کاتی ئەوە هاتووە بیر لەرابردوو نەکەیتەوە.

## عومەری قچاو

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەر گەڕایەوە، دوو مانگی جومادی و مانگەکانی رەجەب و شەعبان و رەمەزان و شەوال/ سێپتامبەر، ئۆکتۆبەر، نۆڤەمبەر، دێسەمبەری ٦٢٨ زایینی- ژانویە، فەوریەی ٦٢٩ زایینی لەمەدینە بەسەر برد و سەرقاڵی ناردنی دەستە شەرکەرەکان بۆ ئەم لاولابوو. دواتر لەمانگی زیحەججە/ئاوریلی ٦٢٩ زایینی بۆ بەجێهێنانی عومەری قضا رۆشتەدەر و هەفتا وشتری قوربانی پێش خۆی خست. لەناو موسوڵمانان، ئەوانەی لەیەکەم عومرەدا هاورێیەتیان کردبوو، ئەمجارەیش بوونە هاورێی. کاتێك خەڵکانی مەککە ئەمەیان بیست، لەبەرابەر ئەو کشانەوە. قورەیشییەکان لەناو خۆیاندا گفتوگۆیان کرد کەپێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی لەدژواریدان. ئەوان لەناو کۆرەکانیان یا لەبەردەم ئەنجومەنی شارەکەیان لەبەرابەر ئەو ریزیان بەست. کاتێك ڕۆشتە شاری مەککە، بالاپۆشەکەی لەخۆیەوە ئالاند و دواتر بازوی دەستی ڕاستی لە قۆڵی بالاپۆشەکەی دەرهێنا و وتی: خوا لەپیاوێك خۆش بێت کەئەمڕۆ بەهێزی خۆی بەوان نیشان بدات. دواتر دروودی بۆ ستونەکان نارد و خۆی و هاوەڵانی هاتنەدەر و دستیان بەڕاکردنی (هەروەلە) بەپەلە کرد. کاتێك ڕۆشتە ناو مەککە عەبدوڵڵە کوڕی رەواحە لەپێشیەوە دەڕۆشت. ئەو جڵەوی وشترەکەی بەدەست گرتبوو، بەرەو پێش دەڕۆشت و دەیوت:

خلوا بنی الکفار من سبیله　　خلوا فکل الخیر فی رسولة
یا رب انی مومن بقیله　　اعرف حق الله فی قبوله
نحن قتلناکمعلة تاویله　　کما قتلناکم علی تنزیله

واتاکەی: ئەی منداڵەکانی خەڵکانی ناباوەڕ، لەرێگاکەی دوورکەونەوە. دوورکەونەوە کەهەموو باشییەکان لەناو و لەدەوری پێغەمبەری خوایە. ئەی خوایە

من باوەڕم بەوتەکانی ئەو هەیە. ڕەزامەندی خوا لەرازی بوون بەوە دەزانم. ئێمە لەگەڵ ئێوە لەسەر نوسراوەکانی ئەو شەڕمان کرد. بەهەمان شێوە کەلەسەر ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ ئێوە شەڕ دەکەین........

پێغەمبەر(د.خ) لەم سەفەرەدا لەگەڵ مەیمونە کچی حارس پەیوەندی هاوسەری بەست و بیست وسێ ڕۆژ لەمەککە مایەوە. بتپەرستەکان بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب پەیامیان بۆ نارد کەبڕوات. وتی: چی دەبوو ئەگەر لەناو ئەوان ئاهەنگی زاوایەتیمان ڕێکدەخست و خورادنمان دروست دەکرد و ئەوان بۆ خواردنی دەهاتن؟ وتیان: ئێمە پێویستمان بەخواردنی ئەو نییە. ئەو لەناو ئەوان ڕۆشتەدەر و یەکەم شەوی زاوایەتی خۆی لەگەڵ مەیمونە لەشوێنێك بەناوی (سرف) بەسەر برد. دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە و پاشماوەی زیحەجە و موحرەم و سەفەر و مانگی ڕەبیعی /ئاوریل، منەی، ژوئەن، ژوئیەی ٦٢٩ زایینی لەم شارە بەسەر برد و سوپاکەی کەلەموتە گرفتار بوو، بەڕێ کرد. لەم ساڵەدا بتپەرستەکان حەجیان کرد.

لەم ساڵەدا کوڕی ئەبی عەوجای سولەمی ڕۆشتە شەڕی منداڵەکانی سەلیم و ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئەو و هاوەڵانی کوژران. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نییە، ئەو ڕزگاری بوو و هاورێکانی کوژران.

## ڕووداوەکانی ساڵی هەشتەمی کوچی (٦٢٩-٦٣٠ زایینی)

## لەمساڵەدا زێنەب کچی پێغەمبەر(د.خ) مرد. واقدی ئاماژەی بەمە داوە.

## شەڕی غالب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی لەگەڵ مناڵەکانی مولەووەح

لەم ساڵەدا، غالب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی کەلبی شێرەپیاوی کەلب، ڕەوانەی شەڕی مناڵەکانی مولەوەح بوو. حارس کوڕی بەرسە ی لەیسی ڕووبەڕووی بوویەوە و موسوڵمانان ئەویان بەئەسیری گرت. وتی: تەنها بۆ باوەڕ هێنان بەئیسلام هاتوومە ئێرە. غالب پێی وت: ئەگەر راستگۆ بیت، بەسترانی یەك شەوە ئازار بەتۆ ناگەیەنێت و ئەگەر درۆزن بیت، بەتوندی تۆمان بەستۆتەوە و لەزیانی تۆ بەئارامی دەخەوین. ئەو یەکێك لەهاوەڵانی خۆی راسپارد و وتی: ئەگەر پەلاماری تۆیدا، بیکوژە. فەرمانی پێدا، تاکاتی گەڕانەوە، لەوێ بمێنێتەوە. ئەوسا ڕۆشتن تاگەشتنە (بطن الكديد) و لەکاتی نوێژێکیتر لەوێ دابەزین. جوندەب کوڕی مەکیسی جۆهەنییان وەك پێشەنگی خۆیان ڕەوانە کرد. جوندەب دەڵێت: من ئاهەنگی تەپۆڵکەیەکم لەوێ کرد تا چاوم لەدانیشتووانی ئەو دەشتە بێت و لەسەرەوە چاودێری ئەوان بکەم. لەوێ لەسەر زەوی راکشام و خۆم بەزەوییەوە نووساند. یەکێك لەوان هات و منی بەخەوتوویی لەسەر زەوی بینی. کەوانەکەی خۆی لەگەڵ دوو تیر هەڵگرت و یەکیانی بۆ من هاویشت کەبەر خاڵیگەم کەوت. تیرەکەم دەرهێنا و لەشوێنەکەی خۆم نەجووڵام. ئەوسا تیری دووەمی بۆهاویشتم کەلەشانم چەقی. دەڵێت: ئەو تیرەیشم دەرهێنا و نەجووڵام. ئەو پیاوە وتی: سوێند بەخوا هەردوو تیرەکەم بەریکەوت و تەکانی نەخوارد. ئەگەر پێشەنگ بوایە، کەمێك تەکانی دەخوارد. دەڵێت: مۆڵەتمان پێدان تا مەڕ و ماڵاتەکانیان ڕۆشتن و دۆشران. لەم کاتەدا بەقورسی هێرشمانکردە سەریان و لەناو ئەوان کوشتارمان ڕێخست و مەڕوماڵاتەکەیانمان گرت و بەپەلە گەڕاینەوە. لەم کاتەدا فریاخوازی ئەو خەڵکە

هــات و داوای هاوکــاری کــرد و دواتــر، شــەڕکەرە فراوانــەکان یارمــەتی تالآنکراوەکانیانـدا کـەتوانای خۆراگریمـان لەبـەردەمیانا نـەبوو. کاتێـك گەشـتینە شوێنێك کەتەنیا قوولاّیی دۆڵەکە لەنێوانماندا بوو، لەبەر ئەوی خواوەند دەیویست ڕزگارمان بکات، هەورێکی نارد کەپڕ بارانتر لەو هەورە پێشتر نەبینراوە. لـەناو ئەو دۆڵـەدا بەئەندازەیـەك ئـاو زۆر بـوو کـەس نەیـدەتوانی لێـی تێپـەڕێت. ئـەوانم بینی سەیرمان دەکەن و هیچ کام ناتوانن هەنگاوێك بۆ پێشەوە بڕۆن. ئێمـە گەڕاینـەوە بۆ مەدینـە. دروشمـی موسـوڵمانان لـەم شـەڕەدا ئـەوە بـوو: بمرێنـە! بمرێنـە! ئـەوان لەنێوان ١١ تا ١٩ کەس بوون.

## شەڕی عەلاءکوڕی حەزرەمی لەبەحرەین

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عەلا کوڕی حەزرەمی ڕەوانـەی شـەڕ لەبـەحرەین کـرد. فەرمانـداری ئـەویٚ لەلایـەن شـای شـاکانی ئێـران، مـونزەر کـوڕی سـاوی بـوو. ئـەو لەسەر ئـەم بنەمایـە لەگـەڵ مونزەر پـەیمانی ئاشتی بەست کە ئاگرپەرستـەکان باج بـدەن و مـەڕە سـەربڕاوەکانی ئـەوان گۆشـتیان نـەخوڕێت و ژنـانی ئـەوان نەبنـە هاوسـەری موسـوڵمانان. دەسـتەیەك دەڵێن: ڕەوانـە کردنـی ئەو لەسـاڵی شەشـەمی کۆچـی / ٦٢٧ زایینی لەگـەڵ ئـەو نێردراوانـە بـوو کەپێغەمبـەر(د.خ) بـۆ دەربـاری پاشاکان ناردی.

لەم ساڵەدا شوجاع کوڕی وەهب ڕۆشتە شـەڕی مناڵـەکانی عـامر. ئەمە لـەمانگی ڕەبیع ئەلئـەوەل، ژوئیـەی ٦٢٩ زایینی ڕوویـدا. دوانـزە پیـاو هاورێیـەتیان دەکـرد. چوارپێکانیان بەتالاّنی گرت بەڕادەیەك هەرکام لـەوان پانزە وشتری پێبڕا. هـەروەها لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی کـەعبی غـەفاری لەگەڵ پـانزە پیـاوی شـەڕکەر ڕۆشتە ذات الاطـلاح و لـەویٚ خـەڵکانێکی زۆری بـینی. پێـشنیاری ئیـسلامی پێکـردن کـەرازی نەبوون و هاورێکانیان کوشت. خۆی رزگاری بوو و بۆ مەدینە گەڕایەوە.

ذات الاطـلاح لەپانتاییـەکانی شـامە. ئـەو خەڵکـە لەقوزاعـە بـوون و ڕێبەرەکـەیان پیاوێك بوو بەناوی سەدوس.

**باوەڕ هێنانی خالید کوڕی وەلید و عەمرۆ کوڕی عاس و عوسمان کوڕی تەڵحە**

لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر/ژوئەنی ٦٢٩ زایینی عەمرۆ کوڕی عاس هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا و خالید کوڕی وەلید و عوسمان کوڕی تەڵحەی عەبدەری هاوڕێیەتیان دەکرد.

هۆکاری باوەڕ هێنانی عەمرۆ ئەوە بو: کاتێك لەگەڵ دەستەی شەڕکەران لەشەڕی خەندەق گەڕاینەوە، بەهاوڕێکانم وت: دەبینم بەردەوام پێگەی محەممەد بەشێوەیەکی مەترسیدار بەرز دەبێتەوە و من بەباشی دەزانم بڕۆمە حەبەشە و پەیوەستی نەجاشی بین. ئەگەر محەممەد بەسەر خەڵکەکەی ئێمەدا زاڵ بێت، ئێمە لای نەجاشین و ئەگەر خەڵکەکەمان بەسەر محەممەد زاڵ بن، ئێمە لەپێشەوە زانیومانە. وتیان: بۆچونی راست ئەوەیە. دەڵێت: خواردن و توێشوی فراوانمان بۆ خۆمان کۆکردەوە و ڕۆشتینە لای نەجاشی. لای ئەوبووین کەعەمرۆ کوڕی ئومەییەی زومری وەك نێردراوی پێغەمبەر(د.خ) هاتە حەبەشە و سەبارەت بەجەعفەر و هاوڕێکانی گفتوگۆی کرد. دەڵێت: من ڕۆشتمە لای نەجاشی و داوام لێکرد عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زومری بەمن بسپێرێت تا وەك نوێنەری قورەیشییەکانی مەککە بیکوژم. دەڵێت: کاتێك قسەکەی منی بیست، توڕە بوو و بەشێوەیەك بەمشت لەلوتی خۆیدا، گومانم کرد شکاندوویەتی. ترسام و وتم: ئەگەر گومانم دەکرد ئەمە پەسەند ناکەیت، هیچ کات نەمدەوت. نەجاشی وتی: ئایا داوای نێردراوی کەسێك لەمن دەکەیت، کەگەورەترین پەیك و پەیامی خوایی کەبۆ موسا دەهات، بۆ ئەو دێت؟ دەتەوێت ئەو بکوژیت؟ وتم: ئەی پاشا، ئایا بەراستی بەو شێوەیە؟ نەجاشی وتی: هاوار لەتۆ ئەی عەمرۆ، گوێ لەقسەی من بگرە و باوەڕی پێ بێنە کەسوێند بەخوا ئەو لەسەر راستی و دروستییە و بێ گومان بەسەر ناحەزانی خۆیدا سەردەکەوێت بەهەمان شێوە کەموسا بەسەر فیرعەون و سوپاکەیدا زاڵ بوو. بەنەجاشیم وت: ئێستا لەبەرژەوەندی پێغەمبەر(د.خ) و لەسەر ئیسلام پەیمانم لەگەڵ ببەستە. ئەو دەستی خۆی هێنا و پەیمانم بەست و باوەڕهێنانی خۆم لەوان دەشاردەوە و هاتمەدەر و بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)

بەرێکەوتم. لەرێگادا خالید کوڕی وەلیدم بینی و ئەمە پێش گرتنی مەککە بوو، خالیدم لەدەرەوەی مەککە بینی. وتم: ئەی باوکی سلێمان، بۆ کویێ دەڕۆیت؟ خالید وتی: سوێند بەخوا رێگا روونـاك بۆتـەوە. ئـەم پیـاوە پێغەمبـەرە. مـن دەڕۆم تـا باوەڕی پێ بێنم. بەڵێ، تاکەی؟ بەخالیدم وت: بزانە منیش دەڕۆم باوەڕ بەمحەممەد بێنم. ئێمە ڕۆشتینە لای پێغەمبەر(د.خ). خالید کوڕی وەلید ڕۆشتە پێش و باوەڕی هێنا، من ڕۆشتمە پێش و باوەڕم هێنا و عوسمان کوڕی تەلحە نزیك بوویەوە و باوەڕی هێنا.

## شەڕی ذات السلاسیل

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ سەرزەمینی بەلی و عوزرە نارد تا خەڵك بۆ باوەڕهێنان هان بدات. دایکی لەبەلی بوو و پێغەمبەر(د.خ) بەم کارە دڵی ئەوانی بەدەست هێنا. عەمرۆ کوڕی عاس ڕۆشت و کاتێك گەشتە ئاوێك لەسەرزەمینی جوزام کەپێیان دەوت سەلاسیل( و لەبەر ئەمە بەم شەڕەیان وت ذات السلاسیل)، ترسا وکەسی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و داوای هاوکاری لێکرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەبوعوبەیدەی جەراحی لەگەڵ یەکەم دەستەی موهاجیرەکان بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد. ئەبوبەکر و عومەر لەناویاندا بوون. کاتێك ئەبوعوبەیدەی رەوانە کرد، فەرمووی: دژایەتی یەك نەکەن. ئەبوعوبەیدە ڕۆشت. کاتێك گەشتە لای عەمرۆ، پێی وت: ئەی عەمرۆ، پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی، دژایەتی یەك نەکەن. ئەگەر تۆ نافەرمانی من بکەیت، من فەرمانبرداری تۆ دکەم. عەمرۆ وتی: من فەرماندەی تۆم. ئەبوعوبەیدە وتی: باشە. لەبەر ئەمە عەمرۆ بووبەپێش نوێژ و لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی عاسی ناردە لای جەیفەر و عەیاز کوڕەکانی جۆلۆندی لەعەممان. ئەم دووانە باوەڕیان هێنا و پێغەمبەریان بەراستگۆ زانی. ئەو لەئاگر پەرستەکان باجی وەرگرت.

## شەڕەکانی خبت و هاوشێوەکانی

هەروەها لەم ساڵەدا شەڕی خبت ڕوویدا و فەرماندەی سوپاکە ئەبوعوبەیدەی جەراح بوو کە لەمانگی ڕەجەب/ نۆڤەمبەر ٦٢٩ زایینی لەگەڵ سێسەد پیاوی شەڕکەر لەموهاجیر و ئەنسار بەڕێکەوت. پێغەمبەر(د.خ) ساز وبەرگ و توێشوی پێدان. توێشوی ئەوان هەمانەیەك خورما بوو. ئەبوعوبەیدە سەرەتا مشت مشت خورمای پێدەدان و دواتر دانە دانە. هەر کام لەوان دەیمژی و دواتر ئاوی بەسەرا دەخواردەوە. زۆری نەخایاند پاشەکەوتی هەمانەکان کۆتایی هات. ئەوان بەخواردنی گەڵای وەریوی دارەکان لەسەر زەوی دەستیان پێکرد، برسیەتی تەنگی پێهەڵچنیبوون. قەیس کوڕی سەعد کوڕی عیبادە نۆ ئاژەڵی بۆ سەربڕین و خواردیان. ئەبوعوبەیدە ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت و ئەویش کۆتایی بەم کارەی هێنا. دواتر دەریا ماسیەکی مردووی خستەبەردەمیان، ئەوان خواردیان و تێربوون. ئەبوعوبەیدە یەکێك لەئێسقانەکانی بەرز کردەوە کە بەرادەیەك گەورەبوو، سوارە دەیتوانی بەئاسانی بەژێریا بڕوات. کاتێك بۆمەدینە گەڕانەوە، ئەم بەسەرهاتەیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) گێڕایەوە و ئەو وتی: ئەو ڕۆژییەی خوا بۆ ئێوەی دەنێرێت، بیخۆن. پێغەمبەر(د.خ) خۆی لێی خوارد. کردەوەی سەعد کوڕی قەیسیان بۆ گێڕایەوە و وتی: بەخشەندەیی عادەتی ئەم بنەماڵەیە.

لەم ساڵەدا لەمانگی شەعبان/ دیسامبەری ٦٢٩ زایینی شەڕێك ڕوویدا کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمانەکەی دەکرد. فەرماندەی سوپا لەدەست ئەبوقتادە و عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی هاوڕێیەتی دەکرد. هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو رفاعە کوڕی قەیس یا قەیس کوڕی رفاعە لەگەڵ تایەفەیەکی گەورە لەمناڵەکانی جوشم لەدارستان دابەزی و بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) خۆی ئامادە کرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەبوقتادە و هاوڕێکانی ڕەوانە کرد تا لەم جوڵەیە ئاگاداری بکەنەوە. ئەمان لەکاتی ئاوابوونی خۆر گەشتنە ئەو دەشتە و هەرکام لەسوچێك خۆیان حەشاردا. سێ یا شانزەکەس بوون. عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی حەدرەد دەڵێت: ئەوان شوانێکیان بوو، بەجێما. رفاعە کوڕی قەیس بەرەو لای ڕۆشت و من تیرێکم بۆ دڵی هاویشت و هیچی نەوت. من سەریم بڕی و هێرشم کردە سەرکەنارەکانی

سوپا وهاوارم دەکرد: خوا گەورەیە. دوو هاورێکەیشم هاواریان کرد: خوا گەورەیە. سوێند بەخوا زۆری نەخایاند زیانی ئەوانمان لەسەر نەما. هاوسەر و منداڵ و بارە سوکەکانی خۆیان هەڵگرت و هەڵاتن. ئێمە وشتر و مەڕی زۆرمان دەست کەوت و ئەوانمان لەگەڵ سەری ئەو شوانە داماوە هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) سیانزە وشتری بەمن بەخشی. من ژنم هێنابوو و ژنەکەم بردبووە ماڵی خۆم. هەر وشترێك بەرابەر بوو لەگەڵ دە سەر مەڕ.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) شەڕکەرانی بەفەرماندەیی ئەبوقتادە بۆ ئیزەم رەوانە کرد و موحەلیم کوڕی جەسامەی لەیسی هاوڕێیەتی دەکرد. عامر کوڕی ئەزبەتی ئەشجەعی سوار لەسەر وشتر لای باروبنەکەی خۆی بوو و بەشێوەی ئیسلام سلاوی لێکردن، بەلام وەلامیان نەدایەوە. موحەلیم کوڕی جەسامە بۆ تۆڵە سەندنەوە و ڕقی کۆن هێرشی کردە سەری و خوێنی ڕشت و وشترەکەی گرت. کاتێك گەشتینە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەوی ئاگادار کردەوە و ئەم ئایە هاتەخوار: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێك زەوی دەبڕن و بۆ شەڕ لەرێگای خوا دەڕۆن، جوان بگەڕێن و بەو کەسەی سلاوتان بۆ دەنێرێت مەڵێن تۆ باوەڕدار نیت. ئێوە بەدوای کالای تێپەڕی ئەم دنیایە دەگەڕێن بەلام خواستەکان لای خوا فراوانە. ئێوەیش پێشتر ناباوەڕ بوون و خوا بەخشینەکانی خۆی بەئێوە بەخشی. ئاگادار بن کەخوا لەوەی دەیکەن ئاگادارە (نسئ ٤/٩٤). دەستەیەك دەڵێن: ئەم شەڕە لەمانگی رەمەزان / ژانویە ٦٣٠ زایینی لەکاتی ڕۆشتنەدەرەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە بوو.

## شەڕی موتە

شیاو بوو ئەم شەڕە پێش بخەین. لەبەر ئەمە دوامانخست شەڕەگەورەکان بەدوای یەکدا بێن و هەرکام دووای ئەویتر ئاماژەی پێبدرێت.

شەڕی موتە لەجمادی ئەلئەوەلی ساڵی هەشتەم/ سپتامبەری ٦٢٩ زایینی ڕوویدا. پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسەی کردە فەرماندەی شەڕکەران و وتی: ئەگەر زەید کوژرا، جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب فەرماندەیی بگرێتەدەست و ئەگەر ئەویش کوژرا، عەبدوڵڵە کوڕی ڕەواحە فەرماندە بێت. جەعفەر وتی: گومانی ئەوەم نەدەکرد زەید بکەیتە فەرمانڕەوایی من. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەرێکەوە چوونکە نازانی کامە باشترە. خەڵک گریان و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ ئێمەت لەگیانبازی بەهرەدار نەکرد؟ ئەو قسەی نەکرد. هەرجار دەیوت: ئەگەر فلاّن کەس کوژرا، فلاّن کەس فەرماندەیی بگرێتەدەست، هەموو ئەو کەسانەی ناوی دەبردن، دەکوژران.

خەڵک کەل و پەلی شەڕ و باروبنەیان هەڵگرت. شەڕکەران سێ هەزار کەس بوون. پێغەمبەر(د.خ) و خەڵک ماڵئاواییان لێکردن و کاتێک پێغەمبەر(د.خ) ماڵئاوایی لەعەبدوڵڵە کوڕی ڕەواحە دەکرد، عەبدوڵڵە گریا. خەڵک پێیان وت: بۆ دەگریت؟ وتی: وتی: گریانم بۆ ئەم جیهانە نییە بەڵکو خۆشەویستیم بۆ ئێوەیە. بیستوومە پێغەمبەر(د.خ) ئایەیەکی بەمشێوەی خوێندۆتەوە: هیچ کام لەئێوە نین مەگەر ئەوەی بڕواتە جەهەننەم و ئەمە فەرمانێکە خواکەتان فەرمانی بەئەنجامدانی داوە (مریم/١٩/٧١). نازانم دوای ئەوەی بڕۆمە دۆزەخ، چۆن دەتوانم لێی بێمەدەر؟ موسوڵمانان وتیان: خواتان لەگەڵ، خوا ئێوە تەندروست بۆ ئێمە بگەڕێنێتەوە. عەبدوڵڵە وتی:

لكنني اسأل الرحمن مغفرة　　وضربة ذات فرغ تقذف الزبدا

اوو طعنة بيدى حران مجهزة　　بحربة تنفذ الاحشاء و الكبدا

حتي يقولوا اذا مروا على جدثى　　ارشدك الله من غاز و قدرشدا

واتاکەی: من لەخوا داوای بەخشین و لێخۆشبوون دەکەم. و توانایی بۆ زەربە لێدانێکی خوێنپڕژێن و بەربلاو کەپەرەدە لەسەر شەڕ هەلگرێت و ژەنگ بسرێتەوە. یا لێدانێك بەدوو دەستی گەرم کەگیان لەجەستەی شەڕکەر جیابکاتەوە، یا زوبینێك جەرگ و دڵ و ریخۆڵە هەڵدرێت و لەت لەتی بکات. تا کاتێك لای ئارامگاکەی من تێدەپەڕن بڵێن: خوا ڕێنیشاندەرت بێت ئەی پیاوی شەڕکەر کەرێگەی راستت دەبڕی.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ماڵئاوایی لێکردن و گەڕایەوە، عەبدوڵلە وتی:

خلف السلام علی امری ودعته          فی النخل خیر مشیع و خلیل

واتاکەی: دوای ئێمە سڵاو لەپیاوێك بێت کەلەناو دارخورماکان سڵاوم بۆ نارد کەباشترین دۆست و چاکترین پێشوازیکەرە.

بەرێکەوتن تاگەشتنە موعان. لێرە بیستیان کەهراکلیوس هاورێ لەگەڵ سەد هەزار شەڕکەری رۆمی، سەد هەزار شەڕکەر لەعەرەب لەلەخم و جوزام و بلقین و بەلی بەسەرکردایەتی پیاوێك بەناوی مالك کوڕی رافلە مەبەستی لەناو بردنی ئەمانیان کردووە. ئەوان لەسەرزەمینی بەلقا دابەزین. موسوڵمانان دوو شەو لەموعان مانەوە و لەبارودۆخی خۆیانیان دەڕوانی. وتیان: بۆ پێغەمبەر(د.خ) نامە دەنوسین و ئاگاداری دەکەینەوە. عەبدوڵلە کوڕی رەواحە ورەی پێدان و وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا، ئەوەی پێتان خۆش نییە، ئەوەیە کەبۆی هاتوون کەبریتییە لەشەهید بوون. ئێمە لەگەڵ خەڵکان لەسەر بنەمای ژمارە و بەهێزی شەڕ ناکەین. تەنیا بەهاوکاری ئەم دینە و لەسەر بنەمای دینە لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەین. بەرێکەون کەجگە لەدوو دواهاتی باش چاوەڕێتان ناکات: سەرکەوتن یا شەهید بوون. خەڵك وتیان: راستی وت. هەمووان بەرێکەوتن. زەید کوڕی ئەرقەم کەهەتیو و دەستپەروەردەی عەبدوڵلە کوڕی رەواحە بوو و عەبدوڵلە ئەوی لەپشت سەری خۆیەوە سوار کردبوو، بیستی کەدەڵێت:

اذا ادیتنی و حملت رحلی          مسیرة اربع بعد الحساء

فشانك فانعمی و خلاك ذم          ولا ارجع الی اهلی ورائی

و جاء المسلمون و غادرونی بارض الشام مشتهی الثواء

وردك كل ذی تسب قريب من الرحمن منقطع الاخاء

هنالك لا ابالی طلع بعل و لا نخل اسافلها رواء

واتاکـەی: ئێـستا ئـەی هـاوڕێی چـالاك پێـی مـن، کاتێـك هـەڵمگرێت و توێـشوودانەکەم و بەچـوار نـاڵ لەزیخەڵانـە گەرمـەکانم تێپـەڕێنی، سـەرقاڵی کـاری خۆت و بە و ڕێگەی خۆت بگرە بەر کەلەسەرکۆنە کردنی من بەدوور بیت. من بۆ دوواوە نایـەم و بۆ لای کەسـەکانی خـۆم ناگەرێمـەوە. کاتێك موسوڵمانەکان بێن و لای مـن تێپـەڕین و بـڕوانن لەسـەرزەمینی شـام جێگـەم خـۆش کـردووە، و هـەر خزمێکی نزیك تۆ لەخۆی دووربخاتەوە، و جگە لەخوای بەخشندە پەیوەندیت لەگەڵ کەس نەبێت، ئەوکات ترسم نییە کەدارخورما بیێهۆ شکۆفەی دەرکردووە یا ڕەگ و ریشەکەی تێراو بوو.

کاتێك زەید ئەم قسەی بیست، بەکوڵ گریا. عەبدوڵڵە وتی: کوڕە، چیت بەسەر دێـت؟ خـوا شـەهیدبوونی بـەمن بەخـشیوە و تـۆ لەسـەر کۆپـانی وشـترەکە دەگەڕێیتەوە. ئەوسا بەرێکەوتن. شەڕکەرانی ڕۆمی و عەرەبەکان لـەدێهاتێك بەناوی بـەلقا کـەپێیان دەوت مەشـارف، ڕووبـەڕوویان بوونـەوە. موسـوڵمانان ڕوویـان لـەدێهاتێك کـرد پێیـان دەوت موتـە. شـەڕ لـەوێ ڕوویـدا. فەرمانـدەیی بـاڵی راسـتی موسوڵمانان لەدەستی قوتەبە کوڕی قتادەی عوزریدا بوو و فەرمانـدەیی بـاڵی چـەپ لەدەسـتی عبایـە کـوڕی مـالکی ئەنساری. شـەڕکەران زۆر بەسـەختی شـەڕیان کـرد. زەید کوڕی حارسە بەئاڵای پێغەمبەر(د.خ) شەڕی کرد بەشێوەیەك لـەناو ڕم بارانی ئـەوان نـوقم بـوو و کـوژرا. دواتـر جەعفـەر کـوڕی ئـەبی تالیـب هـەڵیگرت و بـەردەوام دەیوت:

یاجبذا الجنة اقترابها طيبة باردة شرابها

و الروم روم قددنا عذابها على اذ لاقيتها ضرابها

واتاکـەی: خۆزگـەم بەبەهـشت و نزیکبوونـەوە لێـی. شـەرابەکەی پاکـە و سـارد. ڕۆمییەکان ئەوانەن، کاتی ئەشکەنجەیان هاتووە. لەسەر منە، کاتێك ڕووبەڕوویان

دەبمەوە، بیانکوژم.

کاتێك ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند، لەئەسپەکەی دابەزی، ئەوەندە شەڕی کرد تا گیانی سپارد. جەعفەر یەکەم کەس بوو لەئیسلام چوارپێی لەجولە و هەست خست. لەسەر جەستەی ئەو جێگەی هەشتا و چەند زامی تیر و ڕم و شمشێریان دۆزییەوە. عەبدوڵڵە کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و بۆ پێشەوە هێرشی برد. سەرەتا کەمێك درەنگی کرد و دواتر ڕوویکردە خۆی و وتی:

اقسمت یانفس لتنز لنه طائعه اولا لتکرهنه

ان اجلب الناس و شدوا الرنه ما لی اراك تکرهین الجنه

قد طال ما قد کنت مطمئنه هل انت الا نطفة فی شنه

واتاکەی: ئەی گیانی من، سوێندم خوارد دەبێت بێیتە گۆڕەپانی شەڕ، دەبێت فەرمانبردار بیت وەگەرنە ناچارت دەکەم. ئەگەر خەڵك ئاژاوە دروست بکەن و هاوار بکەن و هێرش بێنن، چیت بەسەر دێت کەدەبینم پشت دەکەیتە بەهەشت. زۆری خایاند ڕۆژگارێك کەئارام بوویت. ئایا تۆ هاوشێوەی تۆوێکیت لەناو مناڵداندا؟

دوبارە وتی:

یا نفس ان لم تقتلی تموتی هذا حمام الموت قد صلیت

و ما تنمیت فقد اعطیت ان تفعلی فعلهما هدیت

واتاکەی: ئەی گیانی من، ئەگەر نەکوژرێیت و بمریت، ئەمە فەرمانی مەرگە گرفتاری بوویت. ئەوەی دەتویست، بەتۆیان بەخشیوە. ئەگەر کاری ئەو دو شەهیدە بکەیت بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی کراویت.

لەئەسپەکەی دابەزی. کوڕە مامەکەی پلەگۆشتێکی کوڵاوی بۆ هێنا و وتی: جەستەی خۆت بەمە بەهێز بکە کەدژواری زۆر ڕووی تێکردوویت. گازێکی لێگرت. لەم کاتەدا هاواری تێکشکان لەسوچێکی لەشکر، بەگوێ گەیشت و بەخۆی وت: هاوار! و هێشتا لەم دنیا زیندوویت! ئەوسا پلە گۆشتەکەی فڕێدا و بۆ پێشەوە ڕۆشت و ئەوەندە شەڕی کرد تا شەهید کرا.

بارودۆخی موسوڵمانەکان دژوارد و دوژمن تەنگی پێهەڵچنین. پێش لەمە قوتەبە کوڕی قتادە، مالیك کوڕی راقیلە، فەرماندەی عەرەبەکانی کوشتبوو.

لەهەمانکات هەواڵێکی ئاسمانی بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت و پۆشتە سەر مینبەر و فەرمانیدا و جارِیاندا: بۆ نوێژ گشتی کۆببنەوە. خەڵك کۆبوونەوە. ئەو سێ جار وتی: رێگەیەکی باش لەپێشە. سەبارەت بەسوپای شەرکەرتان هەواڵتان پێ دەدەم. ئەوان رووبەرِووی دوژمن بوونەوە و زەید لەرێگەی خوا گیانی سپارد. پێغەمبەر(د.خ) داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد. ئەوسا جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و هێرشیکردە سەر دوژمن وئەوەندە شەڕی کرد تا کوژرا. بۆ ئەویش داوای لێخۆشبوونی کرد. دواتر عەبدوڵلە کوڕی رەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت. لێرەدا پێغەمبەر(د.خ) بێدەنگی لێکرد بەشێوەیەك روخساری ئەنسار گۆرِا و گومانیان کرد عەبدوڵلە کارێکی کردەوە لای پێغەمبەر(د.خ) ناپەسەندە. دواتر پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەویش ئەوەندە شەڕی کرد تا گیانی سپارد. دواتر وتی: ئەوان لەسەر تەختە زێرینەکان بەرەو بەهەشت بران و من لەتەختی عەبدوڵلە کوڕی رەواحە بەبەراوەرد کردن لەگەڵ تەختی دو هاورێکەی کەمێك خواریم بینی. پرسیم: ئەمە چییە؟ وترا: ئەو دووانە بەبەهێزی هێرشیان برد و ئەم ماوەیەك درەنگی کرد و دواتر هێرشی برد. کاتێك عەبدوڵلە کوڕی رەواحە کوژرا، سابت کوڕی ئەرقەمی ئەنساری ئاڵاکەی گرتەدەست و وتی: ئەی موسوڵمانەکان، لای کەسێك کۆببنەوە و بیکەنە فەرماندەیی خۆتان. وتیان: گوێ لەفەرمانەکانی تۆ دەگرین. وتی: من فەرماندەیی ناکەم. ئەوان لەدەوری خالید کوڕی وەلید کۆبوونەوە. ئەو ئاڵاکەی هەڵگرت و پاشەکشێی بەدوژمن کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئاڵا کەوتە دەست شمشێرێك لەشمشێرەکانی خوا و خەڵکی گەڕاندەوە. لەو رۆژەوە بەخالد کوڕی وەلید دەڵێن: شمشێری خوا.

هەروەها پێغەمبەر(د.خ) وتی: دوێنێ شەو جەعفەر لەگەڵ چەند فریشتەیەك لای منەوە تێپەڕین، جەعفەر دوو باڵی بوو و باڵەکانی خوێناوی ( لەوکاتەوە پێی دەڵێن جەعفەری باڵندە)

ئەسمە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) هاتە لای من، من لەکارەکانم تەواو ببووم، منداڵەکانی جەعفەرەم شۆردبوو و رۆنم لێدابوون. ئەوانی گرت و بۆنی پێوە کردن و لەچاوەکانی فرمێسك دەباری. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا هیچت لەجەعفەر

بیستووە؟ وتی: بەڵێ، ئەمڕۆ کوژرا. دواتر گەڕایەوە بۆ لای بنەماڵەکەی خۆی و فەرمانیدا بۆ منداڵەکانی جەعفەر خواردن دروست بکەن. ئەمە یەکەم جار بوولەئیسلام خواردنی پرسەیان دروست کرد. ئەسمە کچی عومەیس دەڵێت: من هەستام تا خواردن ئامادە بکەم و ژنان لەدەوری خۆم کۆبکەمەوە. کاتێك لەشکر گەڕایەوە و لەمەدینە نزیك کەوتەوە، پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان پێشوازیان لەشەڕکەران کرد . عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەری هەڵگرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. خەڵك خۆڵیان دەکرد بەسەر سوپاکەدا و بەردەوام دەیانوت: ئەی هەڵاتووان! ئەی هەڵاتووان! پێغەمبەر(د.خ) بەردەوام دەیوت: هەڵاتووان نین بەڵکو بەخواستی خوا هێرشبەرانن.

## گرتنی مەککە

پێغەمبەر(د.خ) دوای شەڕی موتە، مانگەکانی جەمادی الثانی و ڕەجەب/ ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەر ٦٢٩ زایینی لەمەدینە مایەوە. دواتر منداڵەکانی بەکر کوڕی عەبد مەنات هێرشیانکردە سەر هۆزی خوزاعە. ئەوان لەسەر یەکێك لەئاوەکانی خۆیان لەخوارەوەی مەککە بوون. ئەم ئاوە بە(وەتیر)ناودەبرا. هۆزی خوزاعە هاوپەیمانی پێغەمبەر(د.خ) و منداڵەکانی بەکر هاوپەیمانی قورەیش بوون. لەئاشتی نامەکەی حوdەیبیە بەمشێوە پێشبینی کرابوو. هۆکاری ئەم هێرشە ئەوەبوو پیاوێك لەمنداڵەکانی حەزرەمی بەناوی مالك کوڕی عیباد (هاوپەیمانی ئەسوەد کوڕی ڕەزنی دۆئیلی بەکری لەڕۆژگاری جاهلی) بۆ بازرگانی کردن لەماڵەکەی خۆی هاتەدەر. کاتێك گەشتە سەرزەمینی خوزاعە، خەڵکانی خوزاعە کوشتیان و سامانەکەیان هەڵگرت. بەدوای ئەوە منداڵەکانی بەکر هێرشیانکردە سەر پیاوێك لەخوزاعە و خوێنیان ڕشت. خوزاعییەکان هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی ئەسوەد کوڕی ڕەزن یانی سولەمی و کولسوم و زۆئەیب و ئەوانیان لەڕۆژی عەرەفە کوشت. ئەمان لەگەورەکانی منداڵەکانی بەکر بوون. منداڵەکانی بەکر و خوزاعە لەم بگرەوبێنەدا بوون کەئیسلام دەرکەوت و خەڵکی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد. کاتێك ئاشتی حودەیبیە هاتەپێش، خوزاعییەکان هاتنە ژێر پەیمانی پێغەمبەر(د.خ)

وبەکرییەکان چونە ژێر فەرمانی قورەیش. لەم کاتەدا بەکرییەکان ڕۆژگاری ئاشتیان بەهەل زانی و ویستیان ڕقی خۆیان لەخوزاعییەکان بۆ کوشتنی کورەکانی ئەسوەد وەربگرن. لەبەر ئەمە نەوفل کوری مەعاویەی دۆئلی لەگەڵ شوێنکەوتووانی خۆی لەمناڵەکانی بەکر هاتەدەر و لەسەر ئاوی وەتیر شەوانە لەناکاو هێرشیان کردە سەر خوزاعییەکان.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکارەکەی ئەوەبوو پیاوێك لەخوزاعە بیستی کەپیاوێك لەمناڵەکانی بەکر شیعرێك دەخوێنێت کەتیایدا جوێن بەپێغەمبەر دەدات. ئەوسەری پیاوی بەکر شکاند. دوژمنایەتی لەناو ئەواندا دروست بوو و بەکرییەکان هێرشیانکردە سەر خوزاعییەکان و سەرئەنجام لەسەر ئاوی وەتیر لەناکاو شەوانە هێرشیانکردە سەریان. قورەیشییەکان بەنهێنی بەکەلوپەلی شەڕ و چوارپێکان یارمەتی مناڵەکانی بەکرییاندا و دەستەیەك لەوان بەنهێنی شەڕیان بۆ بەکرییەکان کرد وەك سەفوان کوری ئومەییە و عێکرەمە کوری ئەبی جەهل و سەهل کوری عەمرۆ. خوزاعییەکان پەنایان بردەبەر بارەگایی خوایی و دەستەیەك لەوان کوژران. کاتێك خوزاعییەکان ڕۆشتنە بارەگایی خوایی، بەکرییەکان وتیان: ئەی نەوفل، ئەی خوایە، ئەی خوایە، ئێمە ڕۆشتوینە ناو بارەگایی خوای! نەوفل وتی: ئەمری خوایەك لەئارادا نییە. ئەی مناڵانی بەکر تۆڵەی خۆتان وەربگرن و دوژمن بکوژن، بەگیانی خۆم سوێند کە لەناو بارەگایی خوایی ئێوە سنور دەبەزێنن. ئایا لێرەدا تۆڵەی خۆتان وەرناگرنەوە؟

کاتێك بەکرییەکان و قورەیشییەکان پەیمانی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) شکاند، عەمرۆ کوری سالمی خوزاعی کەعبی لەشارەکەی هاتەدەر و ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینە. ئەوسا لەبەرابەر ئەو وەستا و وتی:

لا هم انی ناشد محمدا ... حلف ابینا و ابیه الاتلدا
فوالدا کنا و کنت ولدا ... ثمت اسلمنا و لم ننزع یدا
فانصر رسول الله نصرا اعتدا ... وادع عبادالله یاتوا مددا
فیهم رسول الله قد تجردا ... ابیض مثل البدر ینمی صعدا
ان سیم خسفا وجهه تربدا ... فی فیلق کالبحر یجری مزبدا

ان قريشا اخلفوك الموعدا — ونقضوا ميثاقك الموكدا
وجعلوا لى فى كدا رصدا — و زعموا ان لست ادعو احدا
و هم اذل و اقل عددا — هم بيتونا بالوتير هجدا
فقتلونا ركعا و سجدا

واتاکەی: ئەی خوایە، من محەممەد سوێند دەدەم، بەپەیمانە درێژخایەنەکەمان لەگەڵ باوکی ڕێزداری. ئێمە باوك بووین و تۆ منداڵ. دواتر باوەڕمان هێنا و دەستمان لەتۆ هەڵنەگرت. ئەی پێغەمبەر(د.خ) یارمەتیمان بدە، یارمەتیدانێکی بەهێز و ئامادە. بەندەکانی خوا بانگ بکە تا هاوکاری تۆ بکەن. لەناویاندا پێغەمبەری خوابێت کەشمشێرێکی سپی هاوشێوەی مانگ دەرکێشاوە و بەسەر سەرییەوە دەسوڕێت و تیشك دەپرژێنێت. ئەگەر ستەمی لیٚ بکرێت، روخساری لەتورەییدا دەگۆڕێت و سور و ڕەش دەبێت. لەناو سوپایەکی زۆردا دێت کەوەك دەریایی خرۆشاو کەف هێنابێتە سەر لێو. قورەیشییەکان فێڵیان لەتۆ کرد و پەیمانەکەی تۆیان شکاند. لەبیابان کەمینیان بۆ ئێمە دانا و گومانیان کرد من ناتوانم داوای یارمەتی لەکەس بکەم. ئەوان سوکترین و کەمترینن. ئەو کاتەی ئێمە لەوەتیر خەوتبووین، لەناکاو هێرشیانکردە سەرمان. ئێمەیان کوشتار کرد لەکاتێکدا بۆ نوێژ وەستابووین و دەستەیەکمان لەبەرابەر خوا کوڕنوشمان دەبرد و بیری ئەومان دەکردەوە و دەستەیەکمان سەرمان خستبووە سەرخاك و وەسفمان دەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) وتی: هاوکاریت دەکەم ئەی عەمرۆ کوڕی سالم! ئەوسا دیاردەیەك بۆ پێغەمبەر(د.خ) لەئاسمان دەرکەوت و وتی: ئەم پەڵە هەورە باسی سەرکەوتنی منداڵەکانی کەعب دەکات.

لەنێوان عەبدولموتەلیب و خوزاعە پەیمانێکی کۆن بەسترابوو و لەبەر ئەمە بوو عەمرۆ کوڕی سالم وتی: پەیمانی کۆنی ئێمە لەگەڵ باوکی ڕێزدارت.

دواتر بودەیل و وەرقە لەگەڵ دەستەیەك لەخوزاعە ڕۆشتنەدەر و لەمەدینە گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) . ئەو سەر و روخساری دەشۆرد کەبانگیان کرد و وتی: ئەوا هاتم! ڕۆشتە لای ئەوان و لەڕووداوەکە ئاگاداریان کردەوە. دواتر

گەڕانەوە و ڕوویان لەمەککە کرد. پێغەمبەر(د.خ) بەوانی وتبوو: دەڵێی ئێوە دەبینم چاوتان بەئەبوسوفیان کەوتووە و سەیری ئەو دەکەن کەهاتوون پەیماننامەکە تازە بکاتەوە و لەترسا، ماوەکەی درێژ بکاتەوە. بودەیل بەرێکەوت و لەعوسفان چاوی بەئەبوسوفیان کەوت کەدەیویست بڕواتە لای پێغەمبەر(د.خ)، تا لەترسا، پەیمانەکە تازە بکاتەوە. ئەو لەبودەیلی پرسی: لەکوێوە دێیت؟ وتی: خوزاعە، لەنێوان ئەم دۆڵە. وتی: ئایا نەڕۆشتیتە لای محەممەد؟ وتی: نە. کاتێك ئەبوسوفیان بودەیلی بینی بەهاوڕێکانی وت: سەیری پشکلەکانی وشترەکەی بکەن ئەگەر ناوکی خورمای تیا بێت، بێ گومان ڕۆشتۆتە مەدینە. سەیری پشکلەکانیان کرد و دەنوی خورمایان تیا بینی.

دواتر ئەبوسوفیان بەڕێکەوت و هاتە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەو ڕۆشتە مالی کچەکەی دایکی حەبیبە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) و کاتێك ویستی لەسەر فەرشی پێغەمبەر(د.خ) دانیشێت، دایکی حەبیبە کۆی کردەوە و لای برد. ئەبوسوفیان وتی: فەرشەکەت لەمن بەبەرێزتر دانا یا من لەفەرشەکە؟ دایکی حەبیبە وتی: ئەمە فەرشی پێغەمبەرە و تۆ بتپەرستیت و ناپاك، نەمویست لەسەری دانیشیت. ئەبوسوفیان وتی: دوای من گرفتاری زیان بوویت. ئەو ڕۆشتەدەر و چوە لای پێغەمبەر(د.خ) و قسەی لەگەڵ کرد بەڵام پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی نەدایەوە. ئەوسا ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و داوای لێکرد لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسە بکات. ئەبوبەکر وتی: ئەوە کارە ناکەم. ڕۆشتە لای عومەر و قسەی لەگەڵ ئەو کرد. عومەر فەرمووی: من لای پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئێوە وەك ناوبژیوان بم! سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەورده بەردەم دەست نەکەوێت، بەوە لێتان دەدەم. دواتر ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. فاتیمەی هاوسەری لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی لای بوون و لەمبارەوە قسەی لەگەڵ کردن. عەلی وتی: سوێند بەخوا پێغەمبەر(د.خ) دەیەوێت کارێك بکات کەئێمە لەمبارەوە ناتوانین قسەی لەگەڵ بکەین. دواتر بەفاتیمەی وت: ئەی کچی محەممەد، ئایا دەتوانی بەم کوڕەت فەرمان بدەیت لەنێوان خەڵکان ئاشتی سەقامگیر بکات و پەنای تاوانباران بدات تا سەروەری عەرەب بێت؟ فاتیمە فەرمووی: کوڕەکەم نەگەشتۆتە ئەو پێگەی خەڵك پەنا بدات و لەزیانی شەڕ کەم

بکاتـەوە. دوبـارە ڕوویکـردە عـەلی و وتـی: دەبیـنم کارەکـان بـۆ مـن دژوار بـووە، ئامۆژگاریم بکە. عەلی وتـی: تـۆ سـەروەری کەنانـەیت، هەسـتە و کارەکان لەئەسـتۆ بگـرە و ئاشـتی لـەناو خـەڵکان سـەقامگیر بکـە و پـەنای تاوانبـاران بـدەو بڵـێ کـەخوێنبایی دەدەیـت. دواتـر بـۆ سـەرزەمینەکەی خـۆت بـڕۆ. ئەبوسـوفیان هاتەمزگەوت و وتی: ئەی خەڵکینە، من گوناح و تاوانەکان و خوێنباییەکان دەگرمە ئەستۆ و پـەنای تاوانباران دەدەم و لـەنێوان خـەڵك ئاشـتیم سـەقامگیر کـرد. دواتـر سـوار وشـترەکەی خـۆی بـوو و بـەرەو مەککـە ڕۆشـت و قوڕەیـشییەکانی لـەوەی ڕوویدابوو، ئاگادار کردەوە و پێی وتن عەلی کوڕی ئەبی تالیب چۆن ئامۆژگاری کردووە. وتیان: سوێند بەخوا جگە لەگاڵتە پێکردن بەتۆ هیچی نەکردووە.

دواتـر پێغەمبـەر(د.خ) بـۆ شـەڕ خـۆی ئامـادە کـرد و کەلوپـەلی شـەڕ و باروبنـەی هـەڵگرت و فـەرمانی بەخەڵکیـشدا خۆیـان ئامـادە بکـەن وبـەرەو مەککـە بەرێکـەون. وتـی: ئـەی خوایـە، چـاو و هـەواڵنێران و هەواڵـەکان لـەقوڕەیش دووربخـەرەوە تـا لەناکاو هێرش بکەینە سەر سەرزەمینەکەیان. لەم کاتەدا حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعە نامەیەکی بۆ قوڕەیشییەکان نوسی و بەژنێك بەناوی مۆزینە ڕەوانەی مەککەی کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەسارە کەنیزەکەی منداڵەکانی موتەلیب ناردی. پێغەمبەر(د.خ) عەلی و زوبـەیر کوڕی عـەوامی نـارد و ئـەو ژنـەیان دۆزییـەوە و نامەکـەیان لێسەند. پێغەمبەر(د.خ) حاتبی بانگ کرد و وتی: چی بۆ ئەم کارە هانی دایت؟ حاتـب وتـی: سـوێند بـەخوا مـن بـاوەڕم بـەخوا و پێغەمبـەر(د.خ) هەیـە و هـیچ شـتێکم ئـاڵوگۆڕ یاجێبەجێ نەکردووە. بنەماڵە و منداڵەکانی من لـەناو ئەوانـدان و هـیچ هـۆزێکم نییـە پارێزگاریـان لێبکـەن. بۆیـە باشـەم لەگـەڵ کـردن تـا ڕێـزم بگـرن. عومـەر وتـی: ڕێگـە بـدەن بیکـوژم چـوونکە دوڕوویـی کردۆتـە پیـشە؟ پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: تـۆ چـی دەزانیـت ئـەی عومـەر! لەوانەیـە خـوا لەبەدرییـەکان خـۆش بووبێـت کەفەرموویـەتی: هەرچیتان پێخۆشە بیکەن چوونکە لەئێوە خۆشبووم. خـوا سـەبارەت بەحاتب ئـەم ئایەی نارد: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕدارن، دوژمنـانی مـن و خۆتـان مەکەنـە هـاوڕێ چوونکە ئێوە پەیك و پـەیامی هاوڕێیـەتیان بۆ دەنێرین بـەڵام ئـەوان بـەو راسـتی و دروستیەی بۆ لای ئێوە هاتوون، ناباوەڕن. پێغەمبەر(د.خ) و ئێوە بەگوناحی ئـەوەی

باوەڕتان بەخوا هێناوە، دەردەکەن، ئەگەر بۆ شەڕ لەڕێگەی من و بۆ ڕەزامەندی من دەڕۆن، بەنهێنی چاکە لەگەڵ ئەوان بکەن و من ئاگادارم بەنهێنی و بەئاشکرا چی دەکەن و هەر کەس لەناو ئێوە ئەم کارە بکات، بێ گومان ڕێگەی ڕاستی ون کردووە (ممتحنه/١/٦٠).

پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت و ئەوبرۆهم کولسوم کوڕی حوسەینی غەفاری وەك جێگری خۆی لەمەدینە دیاری کرد و لەدەی مانگی ڕەمەزان/ ٣١ دیسامبەر ٦٢٩ زایینی بەرەو مەککە ڕۆشت. دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ١١ ژانویەی ٦٣٠زایینی مەککەی گرت. ئەو ڕۆژوی گرت تا گەشتە عوسفان و ئەمج. لەوێ ڕۆژوەکانیان شکاند. هەموو موهاجیرەکان و ئەنسار هاوڕێیەتیان دەکرد. لەوێ ژمارەی ئەوانی بژارد کەمنالەکانی سەلیم حەوسەد کەس و موزەینە دەگەشتنە هەزار. هەموو هۆزەکان ژمارە و سامانێکی تایبەت بەخۆیانیان بوو. لەم کاتەدا ئەقرەع کوڕی حابس و عۆیەیینە کوڕی حوسنی فەزاری خۆیان پێگەیاند و عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب لە (زی الحلیفە) یا (سوقیا) وەك کۆچکەرێك خۆی بە پێغەمبەر(د.خ) گەیاند. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی باروبنەکەی بۆ مەدینە بنێرن و خۆی لەگەڵ ئەواندا بڕوات. پێی وت: تۆ دواییینی کۆچکەرانیت و من دواییینی پێغەمبەران.

هەروەها مەخرەمە کوڕی نەوفل چاوی پێیکەوت و ئەبوسوفیان کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب و عەبدوللە کوڕی ئومەییە لە(نیق العقاب) ئەویان بینی. ئەم دووانە داوایان کرد بڕۆنە لای پێغەمبەر(د.خ). دایکی سەلمە سەبارەت بەوان قسەی کرد و وتی: کوڕی مام و کوڕە پورەکەی تۆن. وتی: پێویستم بەو دووانە نییە. کوڕە مامەکەم ئابڕووی من برینەدار کرد و کوڕە پورەکەم لەمەککە ئەوەی وت لەکەس شاراوە نییە. کاتێك ئەمەیان بیست ( و ئەبوسوفیان کوڕێکی پێبوو بەناوی جەعفەر)وتی: سوێند بەخوا یا دەستورێك بەمن دەدات یا دەستی ئەم کوڕە دەگرم و ڕوو دەکەمە بیابان تا هەمووان لەبرسان و لەتینوان گیان بدەین. پێغەمبەر(د.خ) بەزەیی بەواندا هاتەوە و ئەوانی بردە خێوەتەکەی خۆی و باوەڕیان هێنا.

دەستەیەك دەڵێن: عەلی بەئەبوسوفیان کوڕی حارسی وت: لەبەرابەرەوە بڕۆ لای

پێغەمبەر(د.خ) و هەمان شتی پێ بڵێ کەبراکانی یوسف وتیان: سوێند بەخو کەخوا تۆی لەناو ئێمە هەڵبژاردووە ودەستی بەخشینەکانی تۆی بۆ ئێمە ئاوەڵا، ئێمە گوناحکاران بووین) (یوسف/٩١/١٢). ئەو ناتوانێت ببینێت کەس لەو وتار شیرینتر و کردەوە چاکتر بێت. ئەم کارەی کرد و پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: ئەمرۆ هیچ سەرکۆنەیەکتان لەسەر نییە، خوا لێتان خۆش دەبێت و ئەو مێهرەبانترین مێهرەبانەکانە (یوسف/٩٢/١٢). ئەوانی نزیك کردەوە و ئەم دووانە باوەڕیان هێنا و ئەبوسوفیان سەبارەت بەباوەڕ هێنانی خۆی و وەك داوای لێبووردنێك بۆ رابردو وتی:

| | |
|---|---|
| لعمرك انی یوم احمل رایة | لتغلب خیل اللات خیل محمد |
| لكالمدلج الحیران اظلم لیله | فهذا اوانی حیم اهدی و اهتدی |
| و هاد هدانی غیر نفسی و نالنی | مع الله من طردت كل مطرد |

واتاکەی: سوێند بەگیانی تۆ، ئەو رۆژەی ئاڵام هەڵدەگرت و شەڕم دەکرد تا سوپاکەی لات بەسەر لەشکرەکەی محەممەد سەرکەوێت، بێ گومان سەرگەردانێکی رێگەی تاریکی بووم کەشەوەکەی تاریك بووبێت. ئێستا کاتی ئەوەیە من بۆ رێگەی راست بێننەوە و منیش رێگەی راست و دروست تاقیبکەمەوە. رێنیشاندەر لەدەرەوەی خۆم کەمنی بۆ رێگەی راست بانگ دەکرد و هاورێ لەگەڵ خوا بەسەر مندا زاڵ بەلاّم من لەخۆم دورم دەکردەوە.

ئەم قەسیدەیەکی دوورودرێژە. کاتێك وتەکانی گەشتە ئێرە، پێغەمبەر(د.خ) لەڕووی خۆشەویستیەوە دەستێکی لەشانیدا و وتی: ئەمە تۆبوویت تائەو شوێنەی دەتوانیت، منت لەخۆت دووردەکردەوە. دەستەیەك دەڵێن: ئەبوسوفیان لەشەرما، نەیتوانی سەری لەبەرابەر پێغەمبەر(د.خ) بەرز بکاتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) هاورێ لەگەڵ دەهەزار پیاوی شەڕکەر گەشتە (مر الظهران): لەمناڵەکانی غەفار چوارسەد کەس، لەموزەینە یەك هەزار و سێ کەس، لەمناڵەکانی سەلیم حەوتسەد کەس، لەجۆهەینە هەزار و چوارسەد کەس، لەخەڵکانیتر لەقورەیش و ئەنسار و هاوپەیمانەکانی ئەوان و خێڵەکانی عەرەب تا تەمیم و ئەسەد و قەیس هەرکام بەژمارییەکی دیاریکراو. کاتێك لە(مر الظهران) دابەزی،

عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب وتی: قوڕەیش لەناوچوو! سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) لەناکاو هێرشبکاتە سەر قوڕەیشییەکان و شارەکەیان بەزۆر بگرێت، قوڕەیشییەکان بۆهەمیشە لەناو دەچن. سوار ئێسترەکەی پێغەمبەر(د.خ) بوو و وتی: دەڕۆم لەوانەیە حەتاب یاکەسێکیتر ببینم تا بڕواتە مەککە و خەڵکانی مەککە لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بکاتەوە، تا بێن و ئەمانیان بوێت. دەڵێت: ڕۆشتم و لەناو دارەکانی ئەراك دەسوڕامەوە کەلەناکاو دەنگی ئەبوسوفیان و حەکیم کوڕی حەزام و بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعیم بیست کەهاتبوون تا لەبارودۆخ ئاگادار ببنەوە. ئەبوسوفیان وتی: ئاگرێك گەورەتر لەمەم نەبینیوە. بودەیل وتی: خەڵکانێکن لەهۆزی خوزاعە. ئەبوسوفیان وتی: خوزاعییەکان ناتەوانترن لەوەی بتوانن ئاگرێکی بەمشێوە داگیرسێنن. وتم: ئەی ئەبو حەنزەلە، ئەمە تۆیت؟ (هەندێ کات ئەبوسوفیانیان بەئەبوحەنزەلە بانگ دەکرد). وتی: ئەی ئەبوئەلفەزل، ئەمە تۆیت؟ وتم: بەڵێ. وتی: ئەوە منم وەڵامت دەدەمەوە، دایك و باوکم قوربانی تۆبن، چ هەواڵێکت پێیە؟ وتم: پێغەمبەری خوایە، هاوڕێ لەگەڵ دەهەزار پیاوی شەڕکەر لەموسوڵمانان مەبەستی شەڕی ئێوەی هەیە. وتی: چ فەرمانێك دەدەیت؟ وتم: لەپشت سەری من سوار بەتا لەپێغەمبەر(د.خ) ئەمانت بۆ وەربگرم چوونکە سوێند بەخوا ئەگەر دەستی بەتۆ بگات، بێ گومان دەتکوژێت. ئەو لەپشت سەری من سوار بوو. من بەپەلە هاتم و بردمەی لای پێغەمبەری خوا. لای هەر ئاگرێك لەئاگری موسوڵمانان کەتێدەپەڕیم، هەمووان دەیانوت: مامی پێغەمبەرە لەسەر ئێسترەکەی سوار بووە.سەرئەنجام لای ئاگری عومەر کوڕی خەتاب تێپەڕیم. عومەر بەئەبوسوفیانی وت: سوپاس بۆخوا کە بێ پەیمان و ئەمان منی بەسەر تۆدا زاڵ کرد. دواتر بەپەلە بەرەو لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت. من سوار لەسەر ئێستر پێش عومەر کەوتمەوە. عومەر هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئاگاداری کردەوە و وتی: ڕێگەم بدە بیکوژم. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من ئەمانمدا. ئەوسا سەری پێغەمبەرم گرت و وتم: ئەمرۆ جگە لەمن کەس بەنهێنی لەگەڵ ئەو قسە نەکات. کاتێك عومەر پێداگری کرد، وتم: ئەی عومەر، ئارام بە! سوێند بەخوا ئەم کارە لەبەر ئەوە دەکەیت چوونکە ئەو لەمناڵەکانی عەبد مەنافە و ئەگەر لەمناڵەکانی

عودەی بوایە، ئەمەت نەدەوت. وتی: ئەی عەباس، ئارام بە کەباوەڕ هێنانی تۆ لەباوەڕ هێنانی باوکم خەتاب (ئەگەر باوەڕی بەئیسلام دەهێنا) باشترە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بڕۆ کە ئەمانماندا تا بەرەبەیانی سبەی بیهێنیتە لای من. من گەڕامەوە بۆ ماڵ و سبەی بەرەبەیان ئەوم بردە لای پێغەمبەر(د.خ). کاتێك ئەوی بینی وتی: هاوار لەتۆ ئەی ئەبوسوفیان! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە شایەتی بدەیت خوایەك جگە لەخوا نییە؟ وتی: بۆنا، دایك و باوکم قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر جگە لەخوا، خوایەکیتر دەبوو، گرێی لەکارەکانی من دەکردەوە. پرسی: هاوار لەتۆ! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کەبزانی من پێغەمبەری خوام؟ وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، ئەمەیان هێشتا لەدڵمدا تایبەتە بەشتێك. عەباس دەڵێت: وتم: هاوار لەتۆ! شایەتی راستین بدە پێش ئەوەی بتکوژن. دەڵێت: ئەو شایەتیدا و هاوریێ لەگەڵ ئەو حەیم کوڕی حەزام و بودەیل کوڕی وەرقە باوەڕیان هێنا. دواتر پێغەمبەر(د.خ) بەعەباسی وت: بڕۆ ئەبوسوفیان لەجێگەی لوتکەی چیا لەتەنگایی دۆڵەکە رابگرە تا سوپایی خوا لایەوە تێپەڕێت. وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)! ئەو شانازی کردن بەخۆی خۆش دەوێت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: هەر کەس بڕواتە ماڵی ئەبوسوفیان، لەئەماندایە، هەرکەس بڕواتە ماڵی حەکیم کوڕی حەزام، ئاسودەیە، هەرکەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات، ئازاری بەرناکەوێت.

دەڵێت: ئەوم بردە دەر و لەسەر لوتکەی چیاکە ڕامگرت تا هۆزەکان یەك یەك لەبەرابەر ئەو تێپەڕین و ئەو بەردەوام دەیپرسی: ئەمانە کێن؟ دەموت: ئەسلەمن، دەیوت: من چ کارێکم بەئەسلەم هەیە؟ دەیوت: ئەمانە کێن؟ دەموت: جۆهەینە، دەیوت: من چ کارێکم بەجۆهەینە هەیە؟ سەرئەنجام پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دەستەی شەڕکەرانی خۆی(سەوز) لەئەنسار و موهاجیرەکان دەرکەوت کەسەرتاپێ زرێپۆش و جگە لەچاویان هیچ شوێنێکیان نەدەبینرا. وتی: ئەمانە کێن؟ وتم: ئەمە پێغەمبەری خوایە هاوریێ لەگەڵ موهاجیر و ئەنسار. وتی: پاشایەتی کوڕی براکەت فراوان بووە. وتم: هاوار لەتۆ! ئەمە پێغەمبەرییە نەپاشایەتی. وتی: ئەگەر وایە، باشە. وتم: بەپەلە بڕۆ لای خەڵکەکەت و ئاگاداریان بکەرەوە. ئەو ڕۆشت تا گەشتە مزگەوت و حەکیم کوڕی حەزام هاوڕێی بوو. وتی: ئەی قوڕەیشییەکان، محەممەد

لەگەڵ چەندین هەزار پیاوی شەرکەر هاتووە و ئێوە توانایی خۆڕاگری لەبەردەم ئەوتان نییە. وتیان: چی بکەین؟ وتی: هەر کەس بێتە ماڵەکەی من، لەئەماندایە، هەرکەس بڕواتە مزگەوت پارێزراوە و هەرکەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات، ئازاری پێ ناگات. دواتر وتی: ئەی قورەیشییەکان باوەڕ بێنن تا بەزیندوویی بمێننەوە.

لەم کاتەدا ژنەکەی هند هات و ریشی گرت و وتی: ئەی منداڵەکانی غالب، ئەم پیرە خڵەفاوە بکوژن. ئەبوسوفیان وتی: ریشم بەردە، سوێند دەخۆم ئەگەر تۆیش باوەڕ نەهێنیت بێ گومان دەکوژرێیت، بڕۆ بۆ ماڵەوە. ژن ریشی ئەوی بەردا.

پێغەمبەر(د.خ) زوبەیر کوڕی عەوامی بەدوای ئەواندا ڕەوانە کرد و فەرمووی لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکان لەلای (کەدئ ) بڕواتە ناو مەککە. ئەو فەرماندەی باڵی چەپی لەشکرەکە بوو. فەرمانی بەسەعد کوڕی عبادەیش دا هەندێ لەشەڕکەران لەکەدئ وە بباتە ناوشار. کاتێك سەعد ڕۆشت، جاریدا: ئەمڕۆ ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوەیە، ئەمڕۆ ڕۆژێکە ڕێز پێشێل و لەناو دەچێت. پیاوێك لەموهاجیرەکان ئەم قسەی بیست و بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی وت: ئەو بدۆزەرەوە و ئالاکەی لێ بستێنە و تۆ خۆت سوپاکە ببەرە ناو مەککە. ئەو فەرمانی بەخالید کوڕی وەلیددا لەخوارەوەی مەککە لە(لیت)ەوە هێرش بکاتە سەر شار. ئەسلەم، غەفار، مۆزەینە، جۆهەینە و چەندین هۆزیتر لەعەرەب هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەمە یەکەم ڕۆژ بوو پێغەمبەر(د.خ) فەرماندەیی بەخالید کوڕی وەلید بەخشی.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەشتە زی طوا، لەسەر چوارپێکەی خۆی درەنگی کرد. قوماشێکی ڕێ ڕێی سووررەنگی لەسەریەوە ئالاند و زیادەکەی خستە سەر روخساری و وەك لەخۆبووردنێك لەبەرابەر خوا کەبەم شێوە بەخشینەکانی بەو بەخشیبوو، سەری کڕنوشی دانەواند بەشێوەیەك ریشی دەگەشتە خوارەوەی زینەکە. ئەوسا بەرەو پێش ڕۆشت و لەجێگەی (اذاخر) لەسەرەوە ڕۆشت ولەوێ خێوەتی بۆ هەڵدرا.

عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل و سەفوان کوڕی ئومەییە و سەهل کوڕی عەمرۆ،

چەندین دەستەی شەڕکەریان لەخەڵکانی خۆیان کۆکردبوویەوە تا لەبەرابەر پێغەمبەر(د.خ) خۆڕاگری بکەن. ئەحابیش لەگەڵ ئەمان بوون و منداڵەکانی بەکر و منداڵەکانی حارس کوڕی منداڵەکانی عەبد مەنات هاوڕێیەتیان دەکردن. خالید کوڕی وەلید ڕووبەڕوویان بوویەوە و شەڕی لەگەڵ کردن. لەموسوڵمانەکان جابر کوڕی جوبەیلی فیهری و جوبەیش کوڕی خالد (ئەشعەری کەعبی) و سەلمە کوڕی مەیلا کوژران و لەبت پەرستەکان سیانزەکەس، بتپەرەستەکان شکەستیان خوارد و هەڵاتن.

حیماس کوڕی خالدی دۆئلی لەگەڵ عێکرەمە بوو کەبەهاوسەرکەی خۆی وتبوو: نۆکەرێکت لەهاوەڵانی محەممەد بۆ دێنم. کاتێك هەڵاتو و تێکشکاو بۆ لای هاوسەکەری گەڕایەوە، ژن وەك گاڵتە پێکردن پێی وت: کوا نۆکەرەکەت؟ حیماس کوڕی خالید وتی:

فانت لو شهدتنا بالخندمنه — اذ فر صفوان و فر عکرمة

و ابو یزید کالعجوز الموتمه — لم تنطقی باللوم ادنی کلمه

اذ ضربتنا بالسیوف المثلمه — لهم زفیر خلفنا و غمغمه

واتاکەی: ئەگەر لەشەڕی (خەندەمە) لەگەڵ ئێمەدەبوویت و دەتبینی چۆن سەفوان و عێکرەمە هەڵاتن و ئەبویەزید (سەهل کوڕی عەمرۆ) وەك بێوەژنێکی داغدار پەرێشان بوو، یەك وشەت بۆ سەرکۆنەکردنی من نەدەهێنایە سەر زمان. بەشمشێرە ددانداڕەکان هێرشیانکردە سەر ئێمە و ئەوان بەدوای ئێمەدا هاوار و خرۆشیان بوو.

پێغەمبەر(د.خ) بەفەرماندەکانی سوپای خۆ فەرمووبوو کەس نەکوژن مەگەر ئەوەی شەڕیان لەگەڵ بکەن. کاتێك بتپەرستەکان شکەستیان خوارد و هەڵاتن و موسوڵمانەکان دەیانویست بڕۆنە ناو مەککە، ژنانی بتپەرەست ڕووبەڕوویان بوونەوە و سەر و قژی خۆیان ئاڵۆسکاند و بەروسەرییەکانی خۆیان شەقەزللەیان لە روخساری ئەسپەکاندەدا. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی و ئەبوبەکر لەگەڵیدابوو. پێغەمبەر(د.خ) بزەیەکی گرت و وتی: ئەی ئەبوبەکر، دەسپێکی ئەم قەسیدەیە چی بوو کەحسان کوڕی سابت وتی؟ ئەبوبەکر وتی:

تظل جيادنا متمطرات تلطمهن بالخمر النساء

واتاکەی: کاتێك ئەسپەکانی ئێمە هێریشان برد وپێش یەك کەوتن، ژنان بەلەچکەکانی خۆیان شەقەزللەیان لێ دەدەن.

## (ئەوانەی پێغەمبەری خوا فەرمانیدا خوێنیان برێژن)

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەرشتنی خوێنی هەشت پیاو و چوار ژن دابوو. لەپیاوەکان، یەك عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل کە لەئازاردانی پێغەمبەر(د.خ) و دوژمنی و دووڕوویی کردن لەگەڵ ئەو و خەرج کردن بۆ شەڕ دروست کردن، لەبەرابەر ئەو، لەباوکی خۆی دەچوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەککەی گرت، عێکرەمە لەگیانی خۆی ترسا و بۆ یەمەن هەلأت. ژنەکەی دایکی حەکیم کچی حارس کوڕی هوشام باوەڕی هێنا و داوای ئەمانی بۆ مێردەکەی کرد. ئەو لەگەڵ کۆیلە رۆمییەکەی خۆی بۆ دۆزینەوەی هاوسەرەکەی رۆشتەدەر. کۆیلە داوای لێکرد لەگەڵی رابوێرێت. ژن زیاتر تامەزرۆی کرد بەلأم خۆی بەدەستەوە نەدا تا ئەوەی گەشتنە سەرزەمینی هۆزێك لەهۆزەکانی عەرەب و لەوان داوای هاوکاری کرد لەبەرابەر کۆیلەکە. ئەوان، کۆیلەکەیان بەند کرد. ژن کاتێك عێکرەمە دۆزییەوە کەدەیویست سواری کەشتی بێت. بەهاوسەرەکەی وت: لای بەهێزترینی خەڵکان و ئەمەکدارترین کەس بەپەیوەندیەکانی خزمایەتی و خۆڕاگرترین و رێزدارترینیان بۆ لای تۆ هاتووم. ئەمانی بەتۆداوە. عێکرەمە گەڕایەوە. ژن باسی کۆیلە رۆمییەکەی کرد. عێکرەمە پێش ئەوەی باوەڕ بێنێت، کۆیلەکەی کوشت. کاتێك هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) ، لەبینینی شادمان بوو. ئەو باوەڕی هێنا و داوای لەپێغەمبەر(د.خ) کرد داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات. پێغەمبەر(د.خ) داوای لێخۆش بوونی بۆ کرد.

هەروەها لەناو ئەم هەشت پیاوە، سەفوان کوڕی خەلەف بوو. ئەویش خراپەکار و ئازاردەری پێغەمبەر بوو. سەفوان لەترسی گیانی بۆ جەددە رایکرد. عومەیر کوڕی وەهبی جومەحی وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سەفوان گەورەی خەڵکەکەی منە کەلەترسی تۆ رایکردووە، ئەمانی بدە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەو ئاسودەیە. پێغەمبەر(د.خ) دەستارەکەی خۆی، پێدا تا بەئەمانەکە دڵنیا بێت. عومەیر

بەدەستارەکەوە هات و ئەوی لەجەددە دۆزییەوە و ئاگاداری کرد کەئەمانی پێبەخشراوە. پێی وت: پێغەمبەر(د.خ) خۆڕاگرترینی خەڵکە و زیاتر لەهەمووان پەیوەندییە خزمایەتییەکان دەپارێزێت. ئەو کوڕە مامی تۆیە، بەرێزیی ئەو، بەرێزیی تۆیە و شەرەفی ئەو شەرەفی تۆیە. سەفوان وتی: لەگیانم دەترسم. عومەیر وتی: ئەو خۆڕاگرتر لەمەیە. سەفوان گەڕایەوە و بەپێغەمبەری وت: ئەم پیاوە گومان دەکات تۆ ئەمانت بەمن داوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ڕاست دەکات. سەفوان وتی: دە مانگ مۆڵەتم پێبدە تا بتوانم لەو ماوەدا ئایینی دڵخوازی خۆم هەڵبژێرم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: چوار مانگ کاتت هەیە. سەفوان وەك کەسێکی ناباوەڕ لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە و هاوڕییەتی ئەوی کرد لەشەڕەکانی حەنین و تایف و دواتر باوەڕی هێنا. ئەو لەرۆژی ڕەوانە بوونی خەڵك بۆ شاری بەسرە بۆ شەڕی جەمەل لەمەککە گیانی سپارد.

یەکێتر لەوان عەبدوڵڵە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لەمناڵەکانی عامر کوڕی لۆئەی بوو. ئەو باوەڕی هێنابوو و وەحی بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەنوسی. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی بۆ دەخوێندەوە کە(خوا ڕێزداری فرەزانە) دەینوسی(خوا بەرێزی فرەزانە)و ئەم گۆڕانکارییانەی دروست دەکرد. ئەوسا لەدین هەڵگەڕایەوە و بەقورەیشییەکانی وت: من قسەکانی محەممەد لەقورئانەکەی بەوشێوەی دەمەوێت دەینوسم و ئایینەکەی ئێوە باشترە لەئایینەکەی ئەو. کاتێك ڕۆژی گرتنی مەککە هات، بۆ لای عوسمان کوڕی عەففان رایکرد چوونکە بەشیر برای یەکتر بوون. عوسمان ئەوی داشارد تا خەڵك ئارامبوونەوە. دواتر ئەوی بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای ئەمانی بۆ کرد. پێغەمبەر(د.خ) بێدەنگ بوو وبێدەنگی درێژەی کێشا و دواتر ئەمانی پێدا. ئەو باوەڕی هێنا. کاتێك لای پێغەمبەر(د.خ) هاتەدەر، بەهاورێکانی وت: بێدەنگ بووم تایەکێك لەئێوە هەستێت و خوێنی بڕێژێت. یەکیان وتی: بۆ بەئەبرۆ یا بەچاوە نیشانەیەکت بەئێمە نەدا؟ وتی: شیاو نییە بۆ پێغەمبەر(د.خ) بەچاو وبرۆی کایە بکات و لەم ڕێگەوە لەگەڵ هاوڕێ وکەسانی خۆی قسە بکات. پێغەمبەران چاوی فێڵبازیان نییە.

یەکێتر لەوان عەبدوڵڵە کوڕی خەتەل بوو. ئەو باوەڕی هێنابوو و پێغەمبەر(د.خ)

ئەوی بەراستگۆ زانی و ڕەوانەی کرد. پیاوێکی ئەنساری و کۆیلە ڕۆمییەکەی هاوڕێیەتییان دەکرد کەخواردنی بۆ دروست دەکردن و کارەکانی ئەوی ئەنجامدەدا. ڕۆژێك کۆیلەکە دروست کردنی خواردنی لەبیرکرد، عەبدوڵڵە ئەوی کوشت و لەدین هەڵگەڕایەوە. ئەو دوو کەنیزی بوو، گۆرانیان دەخوێند و لەگۆرانییەکانی خۆیان قسەی ناشیرینیان بەپێغەمبەر(د.خ) دەوت. سەعید کوڕی حورەیسی مەخزومی برای عەمرۆ کوڕی حەریس و ئەبوبەرزەی سەلەمی ئەویان کوشت.

یەکێتر لەوان حویریس کوڕی نوقەیز کوڕی وەهب کوڕی عەبدقوسەی بوو. ئەو لەمەککە پێغەمبەری ئازار دەدا و زمانی بۆ خراپ وتنی ئەو بەکار دەهێنا. لەڕۆژی گرتنی مەککە، لەماڵەکەی رایکرد کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب گرتی و خوێنی ڕشت.

لەناو ئەوان مقیەس کوڕی سوبابە بوو. پێغەمبەر(د.خ) بۆیە فەرمانی کوشتنیدا چوونکە پیاوێکی ئەنساری کوشت کەبراکەی هوشامی بەهەڵە کوشتبوو. ئەو لەدین هەڵگەڕایەوە، لەڕۆژی گرتنی مەککە، خەڵکانی مەککە شکەستیان خوارد، لەشوێنێك خۆی شاردەوە و لەگەڵ دەستەیەك سەرقاڵی خواردنەوە بوون. نومەیلە کوڕی عەبدوڵڵەی کەنانی بەشوێنەکەی زانی، ڕۆشت و بەشێوەیەك بەشمشێر لێیدا، یەکسەر ناردی بۆ جەهەننەم.

یەکێتر لەوان عەبدوڵڵە کوڕی زەبعەری سەهمی بوو کە لەمەککە قسەی ناشیرینی بەپێغەمبەر(د.خ) دەوت و وتاری ناشیرینی دەهێنایە سەرزمان. ڕۆژی گرتنی مەککە ئەو و هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهبی مەخزومی هاوسەری دایکی هانی کچی ئەبوتالیب رایان کرد بۆ نەجران. هوبەریرە لەوێ وەك بتپەرەست ژیانی بەسەر برد تا مرد بەڵام کوڕی زەبعەری گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای لێخۆش بوونی کرد. کاتێك باوەڕی هێنا، وتی:

| | |
|---|---|
| یا رسول المليك ان لسانی | راتق ما فتقت اذ انابور |
| اذ اباری الشيطان فة سنن الغ | ی و من مال ميله مثبور |
| امن اللحم و العظام بربی | ثم نفسی الشهيد انت نذير |

واتاکەی: ئەی پێغەمبەری خوا، زمانی من پەیوەندەری ئەو شتەیە کەپچڕاندم کاتێك پیاوێکی خراپ بووم. کاتێك بەخێرایی لەڕێگەی خراپە پێش شەیتان

دەکەوتمەوە و هەرکەس ڕێگەی ئەو بگرێتەبەر، لەناو دەچێت. گۆشت و ئێسقانەکانم باوەڕیان بەخوا هێنا و گیانی من شایەتیدا تۆ پێغەمبەرێکی راست و دروست و ئاگادارکەرەوەیت.

یەکێتر لەوان وەحشی کوڕی حەرب بکوژەکەی حەمزە بوو. ئەو ڕۆژی گرتنی مەککە بۆ تایف رایکرد و دواتر لەگەڵ وەفدی نوێنەرایەتی خەڵکی تایف هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوا نییە و شایەتی دەدەم محەممەد پێغەمبەری خوایە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوە تۆیت وەحشی؟ وتی: بەڵێ. وتی: پێم بڵێ چۆن مامەمت کوشت. ئەو بۆی باس کرد و پێغەمبەر(د.خ) گریا و فەرمووی: روخسارت لەمن بشارەوە. ئەو یەکەم کەس بوو بۆ خواردنەوەی شەراب قامچی لێدرا و یەکەم کەس بوو جلی ناسکی زەردی ڕەنگ رازاوەی شامی لەبەر کرد.

حویتەب کوڕی عەبدولعوزەی رایکرد و خۆی شاردەوە. ئەبوزەر ئەوی لەباخێکدا بینی و پێغەمبەری لەشوێنەکەی ئاگادار کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: مەگەر ئێمە بەخەڵك ئەمانمان نەداوە جیاواز لەوانەی فەرمانی کوشتنیانمان داوە؟ ئەبوزەر ئەمەی پێ وت. ئەو هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا. دەڵێن: ماوەیەك دواتر ڕۆژێك ڕۆشتە لای مەروان کوڕی حەکەم و مەروان فەرمانداری مەدینە بوو. پێی وت: ئەی پیرەپیاو، ئیسلامت پشت گوێ خست. حویتەب پێی وت: چەندین جار ویستم باوەڕ بێنم بەڵام هەمیشە باوکت (حەکەم کوڕی ئەبی عاس) ڕێگەی لێ دەگرتم.

## ئەو ژنانەی پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەکوشتنیاندا

لەناو ئەم ژنانە یەکیان هند کچی عوتەبە بوو کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمانی کوشتنی ئەوی دەکرد و ئەمە لەبەر ئەو کارانە بوو(وەك بڕینی گوێ و لوت و ئەندامەکانیتر) کەلەگەڵ جەستەی حەمزە کردبووی. ئەو پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە ئازار دەدا. هند بەنهێنی لەگەڵ ژنانیتر هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا و هەموو بتەکانی ماڵی خۆی شکاند و وتی: ئێوە ئێمەتان فریودابوو. بۆ پێغەمبەر(د.خ) دوو بەرخی وەك دیاری هێنا و لەکەم زانی مەڕەکانی گلەیی کرد. پێغەمبەر(د.خ) لەخوا بۆ ئەو پاڕایەوە تا مەڕەکانی زیاد بکات و مەڕەکانی زیادی کرد. ئەو بەردەوام لێی دەبەخشی و دەیوت: ئەمانە لەبەرەکەتی پێغەمبەرە، سوپاس بۆ ئەو خوایەیی ئێمەی بۆ ئیسلام رێنوێنی کرد.

یەکیتر لەوان سارە کویلەی عەمرۆ کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم کوڕی عەبد مەناف بوو. ئەمە ئەو ژنە بوو (بەوتەی هەندێ کەس) نامەی حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعەی هەڵگرت تا بیبات بۆ قوڕەیشییەکان. ئەو وەك موسوڵمان هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) شتێکی پێ بەخشی بەلاّم سارە لەدین هەڵگەڕایەوە و بۆ مەککە گەڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی کوشتنیدا و عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی کوشت.

لەژنەکان دوو کەنیزەکەی عەبدوڵڵە کوڕی خەتەل بوون کەگۆڕانیان دەخوێند ولەناو گۆرانییەکانی خۆیان جوێنیان بەپێغەمبەر(د.خ) دەدا. یەکێك لەوان بەناوی قوریبە کوژرا و ئەویتریان رایکرد و روخساری گۆڕی و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا. ئەو تا رۆژگاری فەرمانڕەوایی عومەر کوڕی خەتاب ژیا و لەم کاتەدا کەسێك بەهەڵە، کردی بەژێر ئەسپەکەیدا و کوشتی. دەستەیەك دەڵێن: تا کاتی فەرمانڕەوایی عوسمان کوڕی عەففان ژیا و لەم کاتەدا پیاوێك بەهەڵە یەکێك لەپەراسووەکانی شکاند کەلەئازارەکەی مرد و عوسمان قەرزی ئەم ژنەی لەجیاتی تاوان خستە ئەستۆی ئەو ژنە.

## کارەکانی پێغەمبەر( د.خ ) لەمەککە

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مەککە، دەستاڕێکی ڕەشی پێوە بوو. ئەو لەبەر دەرگـای کەعبـە وەسـتا و وتـی: خوایـەك جگـە لـەخوا نییـە، بەڵێنەکـەی خـۆی هێنایـەدی، یارمـەتی بەندەکـەی خۆیـدا و دەسـتە شـەڕخوازەکانی تێکشکاند. هـەر خوێن یـا زیـان یاتاوانێـك یـا سـامانێك کەکەسێك لەیـەکیتری داوابکات، لـەژێر دوو قاچی مندایە مەگەر دەرگاوانی ماڵی خوا و ئاو گەیاندن بەحاجییەکان. دواتر وتـی: ئەی قوڕەیشییەکان، گومـان دەکـەن لەگـەڵ ئێوە چۆن هەڵسوکەوت دەکـەم؟ وتیـان: باشترین کردار، برایەکی گەورەیت و برازایەکی مێهرەبان. وتـی: بڕۆن ئێوە ئازادن. خـوا ئـەوی بەسـەر ئەوانـدا زاڵ کردبـوو و ئـەو بـەپێی بنـەماکانی شـەڕ دەیتـوانی هـەموویان بەکۆیلەیـەتی بگرێـت. لەبـەر ئەمـە خـەڵکانی مەککـە بـەئازاد کراوەکـان ناویـان دەرکـرد. ئـەو حـەوت جار بـەدەوری کەعبـە سوڕایەوە و ڕۆشـتە نـاوی و بۆ نوێـژ وەسـتا. لـەوێ وێنـەی پێغەمبـەرانی بینی و فەرمانیـدا بیانسڕنەوە. لەسـەر کەعبـە سێـسەد و شەسـت بـتی لـێ بـوو و لەدەسـت ئـەو قامـچییەکی داریـن. بـەو قامچییە ئاماژەی بۆ بتەکان دەکرد و ئـەم ئایـەی دەخوێنـد: بڵـێ ڕاسـتی و دروسـتی هـات و چـەوتی و لاری بەسـەر چـوو چوونکە چەوتی لەناودەچێت(اسرا ٨١/١٧). ئامـاژەی بـۆ هـەر بتێك دەکرد، دەکـەوت. دەڵێن: بەمشێوە نـەبوو، بەڵکو فەرمانیـدا ئەوانیان داگرت و شکاندیان و وردیان کرد.

دواتـر پێغەمبـەر(د.خ) لەسـەفا بـۆ بەیعـەت دانیـشت. عومـەر کـوڕی خـەتاب لەخوارییەوە بوو. خەڵك بۆ بەیعەت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە تا باوەڕ بێنن. ئـەو لەگـەڵ ئـەوان لەسـەر بنـەمایی گوێڕایـەڵی و فـەرمانبرداری لـەخوا و پێغەمبەرەکەی، تا ئەو شوێنەی بتوانن، بەیعەتی بەست.

بەیعەت لەگەڵ ژنان بەمشێوە بووکاتێك لەبەیعەت لەگەڵ پیاوان تـەواوبوو، ژنـانی قوڕەیش دەستە دەستە دەهاتنە لای ئەو. ئـەم ژنانـە لەناویانـدا بـوون: دایکی هـانی کـچی ئـەبوتالیب، دایکـی حـەبیب کـچی عـاس کـوڕی ئومەییـە ژنـی عـەمرۆ کـوڕی عەبـدودی عـامری، ئـەورا کـچی بـاوکی عـەیس پـوری عـەتاب کـوڕی ئوسـەید،

خوشـکەکەی عاتکـە کـچی بـاوکی عـەیس ژنـی موتـەلیب کـوڕی بـاوکی وەداعـەی سـەهمی، دایکـی کـچی عـەففان کـوڕی ئـەبی عـاس خوشـکی عوسمـان ژنـی سـەعد هاوپەیمانی منالّەکانی مەخزوم، هند کچی عوتەبە ژنی ئەبوسوفیان، یەسیرە کچی سەفوان کوڕی نەوفل کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی، دایکی حەکیم کچی حارس کوڕی هوشام ژنی عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل، فاتمە کچی وەلید کوڕی موغەیرە خوشکی خالد ژنی سەفوان کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف، ڕیتە کچی حەجاج ژنی عەمرۆ کوڕی عاس و هاوشێوەکانی. هند بەنەناسراوی پۆشت چوونکە جەستەی حەمزەی بەشێوەیەك ناشیرین کردبوو دەترسا، سزای بدەن. پێغەمبەر(د.خ) بەوانی وت: لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵ من بەیعەت بکەن کە شەریك بۆ خوا دانەنێن. هند وتی: سوێند بەخوا تۆ پەیمانێك لەئێمە وەردەگریت، هاوشێوەکەی لەپیاوان داوا ناکەیت بەلاّم ئێمە هەموو پەیمانەکان بەتۆ دەدەین. پێغەمبەر(د.خ) وتی: نابێت دزیش بکەن. هند وتی: سوێند بەخوا من لەم لاو لەولا، شتێکم لەسامانەکەی ئەبوسوفیان هەڵدەگرت. ئەبوسوفیان کەلەوێ ئامادە بوو، وتی: سەبارەت بەڕابردوو لێت خۆش دەبم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: تۆیت هند؟ وتی: من هندم. لەڕابردوو خۆشبە تا خوا لێت خۆش بێت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: نابێت زیناش بکەن. هند وتی: ئایا ژنی ئازادە زینا دەکات؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: نابێت منالّەکانی خۆتان بکوژن. هند وتی: لەمنالّیەوە بەخۆشەویستی گەورەمان کرد و تۆ ئەوانت لەڕۆژی بەدر کوشت، تۆ و ئەوان باشتر دەزانن چیمان بەسەر هاتووە. لێرەدا عومەر کوڕی خەتاب پێکەنی. پێغەمبەر(د.خ) وتی: درۆیەك مەکەن کەڕاستییەکەتان لەبەردەمایە. هند وتی: درۆ کردن و تۆمەت بەستن قێزەونە بەلاّم لێخۆشبوونەکان خۆشترە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: لەکارە باشەکان نافەرمانی من مەکەن. هند وتی: لێرە دانەنیشتوین تا نافەرمانی تۆ بکەین. پێغەمبەر(د.خ) بەعومەر کوڕی خەتابی وت: لەوان بەیعەت وەربگرە. پێغەمبەر(د.خ) داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن. پێغەمبەر(د.خ) دەستی لەجەستەی هیچ ژنێك نەدەدا و لەگەڵ ژنان تەوقەی نەدەکرد و ئەوانیشت تەوقەیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) نەدەکرد. ئەمە جیاواز بوو لەو ژنانەی خوا بۆ ئەوی حەلاڵ کردبوو یا ئەو ژنانەی مەحرەمی بوون.

کاتێك نیمەڕۆ داهات، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەبیلال دا بڕواتە سەر کەعبە وبانگ بڵێت. قوڕەیشییەکان لەسەر کوێستانەکان بوون، هەندێکیان ئەمانیان دەویست و هەندێك ئامانیان پێدرابوو. کاتێك بانگیدا و وتی: شایەتی دەدەم محەممەد پێغەمبەری خوایە، جویریە کچی ئەبوجەهل وتی: خوا ڕێزی لەباوکمان گرت کەتا ئێستا زیندوو نییە و زەڕەزەڕی بیلال لەسەر کەعبە نابیستێت. دەستەیەك دەڵێن: خوا بیر کردنەوەی محەممەدی هەڵکرد. ئێمە نوێژ دەخوێنین بەڵام بکوژانی براکانمان خۆش ناوێت. خالید کوڕی ئەسەد برای عوسمان کوڕی ئەسەد وتی: خوا ڕێزی لەباوکی من گرت کە زیندوو نییە و ڕووداوەکانی ئەمڕۆ نابینێت. حارس کوڕی هوشام وتی: خۆزگە پێش لەمە مردبووم. هەندێکیتریش لەم قسانەیان هێنایە سەرزمان. دواتر هەموویان باوەڕیان هێنا و خوا لەوان خۆش بوو.

## ( لێکدانەوەی هەندێك لەوتارەکان )

ئەوەی دایکی سەلمە بەپێغەمبەری وت: ئەم دووانە (ئەبوسوفیان کوڕی حارس و عەبدوڵڵە کوڕی ئومەییە) کوڕە پوڕ و کوڕە مامی تۆن، مەبەستەکەی ئەوەبوو ئوبوسوفیان کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕە پوڕیەتی و عەبدوڵڵە کوڕی ئومەییە کوڕی مامی ئەو. ئەو برای باوکی ئەو ژنە بوو و دایکی عاتیکە کچی عەبدولموتەلیب. ئەوەی وتی: لەمەککە زۆری قسەی ناشیرین و ناڕەوا کرد، لەبەر ئەوە بوو لەمەککە وتبووی: باوەڕ بەتۆ ناهێنین مەگەر ئەوەی لەبەر چاوی ئێمەدا بڕۆیتە ئاسمان و بەڕۆشتنت ڕازی نابین مەگەر ئەوەی کتێبێکی شیاوی خوێندنەوەمان بۆ بهێنیت. هەندێك لەزانا گەورەکان لێرەدا بەتەواوی بەهەڵە قسەیان کردووە چوونکە وتوویانە: مەبەستی دایکی سەلمە لەوەی کە: ئەو کوڕە مامی تۆیە، ئەوە بوو کە باوەگەوڕێی دایکی پێغەمبەر(د.خ)، دایکی عەبدوڵڵە مەخزومی و عەبدوڵڵە کوڕی ئومەییە، مەخزومی بووە و لەبەر ئەمە ئە و دەبێتە (کوڕی پوری دایکی) نەك کوڕی پوڕی باوکی.

## شەڕی خالید کوڕی وەلید لەگەڵ مناڵەکانی جەزیمە

لەم ساڵەدا خالید کوڕی وەلید بۆ شەڕی مناڵەکانی جەزیمە ڕۆشت. پێغەمبەر(د.خ) دوای گرتنی مەککە، شەڕکەرانی بۆ دەوروبەری مەککە نارد و فەرمانیدا خەڵکان بۆ سەر باوەڕ هێنان هان و لەم ڕێگادا بجەنگن. لەناو ئەو کەسانەی ڕەوانەی کرد، خالید کوڕی وەلید بوو. ئەوی وەك مژدەدەرێکی ئیسلام نارد نەك وەك شەڕکەر یا کەسێك کەشمشێر لەکالان بکێشێت. ئەو لەسەر یەکێك لەئاوەکانی جەزیمە لای عامر کوڕی عەبد مەنات کوڕی کەنانە بەناوی غومەیسا، دابەزی. مناڵەکانی جەزیمە لەڕۆژگاری جاهلی، عەوف کوڕی عەبدعەوف باکی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و فاکە کوڕی موغەیرە مامی خالیدیان کوشتبوو. ئەم دووانە وەك بازرگان لەیەمەنەوە هاتبوون و مناڵەکانی جەزیمە سامانەکانی ئەوانیان گرتبوو و هەردووکیان کوشتبوو. کاتێك خالید گەشتە سەر ئاوەکە، مناڵەکانی جەزیمە کەلوپەلی شەڕیان هەڵگرت. خالید وتی: شمشێرەکانتان دانێن کەخەڵك باوەڕیان بەئیسلام هێناوە. ئەوان شمشێرەکانیان خستە سەر زەوی. خالید فەرمانیدا بازو و شانی ئەوانیان بەستەوە و ئەوکاتە کوشتاریان کردن.

کاتێك ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر(د.خ) گەشت، هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: ئەی خوایە، من لەو کارەی خالید کردی بێزاری خۆم دەردەبڕم، ئەوکات عەلی بەسامانێکی زۆرەوە بۆ سەرزەمینی ئەوان نارد تا خوێنبایی کوژراوان و سامانەکانیان بۆ بگێڕێتەوە. تاوان و خوێنباییدا بەشێوەیەك ئاوخۆری سەگیشیان حسێب کرد. لەگەڵ ئەوەیشدا بەشێك لەو سامانەی پێغەمبەر ناردی، زیادەبوو. عەلی پێی وتن: ئایا دارایی یا خوێنێك ماوە، بەهاکەی نەدرابێت؟ وتیان: نە. عەلی وتی: ئەم سامانە زیادەیە و ئەمە لەڕێزداری پێغەمبەر(د.خ) بەئێوە دەبەخشم. ئەو ئەم کارەی کرد و بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و بۆی باس کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: کارێکی ڕاست و دروستت ئەنجامدا.

دەستەیەك دەڵێن: خالید داوای لێبووردنی کرد و وتی عەبدوڵڵە کوڕی حوزافەی سەهمی لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەم فەرمانەی پێداوە. لەسەر ئەم کارە لەنێوان

عەبدولرەحمان و خالید کوڕی وەلید شەڕە قسە ڕوویدا. عەبدولرەحمان وتی: لەسەردەمی ئیسلام کاری ڕۆژگاری جاهلیت کرد. خالید وتی: من تۆڵەی خوێنی باوکی تۆم کردەوە. عەبدولرەحمان وتی: درۆ دەکەیت، من خۆم بکوژی باوکم کوشت بەڵام تۆ تۆڵەی مامت سەندەوە. شەڕە قسەکەیان بەرز بوویەوە و زیانیان بەیەك گەیاند. ئەم قسانە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت و وتی: ئەی خالید ئارام بە و دەست لەهاوەڵانی من هەڵگرە کەسوێند بەخوا ئەگەر بەئەندازەی هەموو کێوی ئۆحۆد زێرت هەبێت و هەمووی لەرێگای خوادا ببەخشیت، بەئەندازەی کاری بەیانی یا ئێوارێی یەکێك لەمانە نابێت.

عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی دەڵێت: لەم ڕۆژەدا من لەسوپاکەی خالیددا بووم. دوای چەندین وشتری باری کەوتین کەچەندین گەنج لێیان دەخوڕی. خالید وتی: ئەوانە بگرن. بەدوایانا ڕۆشتین و کاتێك ئەوانمان دۆزییەوە، ڕۆشتن و کوڕێکی گەنج ڕووبەڕوومان وەستا و شەڕی لەگەڵ کردین و بەردەوام دەیوت:

ارفعن اطراف الذيول و ارتعن      مشى حييات كان لم تفزعن

ان تمنع اليوم النساء تنمنعن

واتاکەی: کەنارەی داوێنەکان بگرن و بلەوەڕێن هاوشێوەی ژنە شەرمێونەکان کەنەترساون. ئەگەر ئەمرۆ ژنان پارێزگاریان لێبکرێت بەردەوام پارێزراون.

ئێمە شەڕمان لەگەڵ کرد و شەڕمان درێژ کردەوە تا توانیمان بیکوژین. دواتر ڕۆشتین و خۆمان گەیاندە وشترەکان. کوڕێك وەك ئەوەی یەکەم هات و دەستی بەشەڕ کرد و دەیوت:

اقسم نا ان خادر ذو لبده      يرزم بين اثلة و وهده

يفرس شبان الرجال وحده      باصدق الغداة منى نجدة

واتاکەی: سوێند دەخۆم هیچ شێرێکی یاڵدار لەناو پەستی و بەرزایی و دارە زۆرەکان هێرش ناهێنێت و جوامێرەکان بەتەنیایی لەناو ببات، لەمن بوێرتر و لەهاوکاری کردنی هاورێکانی خۆراگرتر بێت.

ئێمە شەڕمان لەگەڵ کرد و کوشتمان، دواتر وشتر و ژنەکانی ئەوانمان گرت. لەناو ئەوان گەنجێکی جوان روخسارمان بینی، رەنگی روخساری زەرد بوو.

بەتەنافێك بەستمانەوە و هێنامان بیکوژین. پێی وتین: ئایا باشتر لەمەتان دەوێت؟ وتمان: چی بێت؟ وتی: لەگەڵ من وەرن تا لەخوارەوەی دۆڵەکە کاروان و کاروانییەکانتان نیشان بدەم و دواتر بمکوژن. وتمان: ئەو کارە دەکەین. ئێمە ڕووبەڕووی کاروانەکە بووینەوە و کاتێك گەشتە شوێنێك کەژنان دەنگیان دەبیست، بەبەرزترین دەنگی خۆی قیژاندی: تەندروست بمێنە حوبەیش کەئێمە گیانمان لەرێگەی تۆدانا. لەم کاتەدا کچێکی زور سپی و لەرادەبەدەر جوان هاتەدەر و وتی: خۆشەویستم، خۆراگر بە کەدوژمنان زۆرن و تۆ لەتاقیکردنەوەدا گرفتاریت. کوڕ وتی: سلاٚ، لەتۆ بۆ ڕۆژگارێکی درێژ، هەرچەند بسوتێیت لەئاگر خۆشەویستی و نیاز. کچ وتی: سلاٚو لەتۆ دەجار، کەجوتەکان پێتدەگەن فراوان و تاکەکان پەیوەستی دەبن بێ ژمار.

کوڕ وتی:

ان يقتلونى يا حبيش فلم يدع هواك لهم منى سوى غلة الصدر

فانت التى اخليت لحمى من دمى و عظمى و اسبلت الدموع على نحرى

واتاکەی: ئەی حوبەیش ئەگەر من بکوژن، خۆشەویستی تۆ لەسینەی من بۆ ئەوان جگە لەهەڵقولاٚنی ڕق و کینە هیچ بەجێ ناهێڵێت. ئەمە تۆبوویت خوێنت لەگۆشت و ئێسقانی من دەرکێشا و فرمێسکی منت لەسەر سینەم ڕەوان کرد.

کچی پێی وت:

و نحن بكينا من فراقك مرة و اخرى و اسيانك فى العسر و اليسر

و انت فلم تبعد فنعم فتى الهوى جميل العفاف و المودة فى الستر

واتاکەی: ئێمە جارێك لەدوری تۆ فرمێسکمان ڕژاند. جارێکیتر فرمێسکمان باراند و لەدژواری و بەختەوەری لەگەڵ چاکە و خراپەی تۆ هەڵمان کرد. ئەی خۆشەویست دوور نەبیت کەجوامێرێکی لێوانلێو لەخۆشەویستی بوویت و داوێنپاکیت کردە پیشە و نهێنی خۆت بەنهێنی هێشتەوە.

کوڕ پێی وت:

اريتك اذا طالبتكم فوجدتكم بحلية او الفيتكم بالخوانق

| | |
|---|---|
| الم يك حقا ان ينول عاشق | تكلف ادلاج السرى فى الودائق |
| في ذنب لى قد قلت اذ نحن جيرة | اثيبى بود قبل احدى الصفائق |
| اثيبي بود قبل ان تشحط النوى | وينای الامير بالحبيب المفارق |
| فانى لاسر لدى اضعته | ولا منظر مذغبت عنى برائق |
| على ان ما ناب العشيرة شاغل | ولا ذكر الا ان يكون لوامق |

واتاکەی:

ئایا بیردەهێننەوە بەدوای ئێوەدا گەڕام و ئەوکات ئێوەم لەناو دۆڵەکە یا لەشار دۆزییەوە یا لەتەنگاییەکانی کوێستان؟ ئایا ماڤ عاشقی دەردەدار نییە ڕەنجی سوڕانی شەوانە لەگەرمێن یا لەگەرمای سوتێنەر بەدوای دڵدار بەو ببەخشن؟ لەهەمان کات کەدراوسێ بووین، وتم من گوناحم نییە، لەخۆشەویستی من کەڵك وەربگرە پێش ئەوەی یەکێك لەئازارە گەورەکان بگات، ڕوو لەباشبوونەوە بکە. لەخۆشەویستی من کەڵك وەربگرە پێش ئەوەی جیایی بەبڕینێکی کەم، ئێمە وەك گیان و جەستە لەیەك جیا بکاتەوە و سەرکردەی ستەمکاران، خۆشەویستە نازەنینەکەم بەدوای خۆیدا بکێشێت و بۆ دووردەستەکانی ببات. من هیچ نهێنییەکەم ئاشکرا نەکرد و هیچ دیمەنێکم لەو کاتەوەی لەبەرچاوم ونبوویت، خۆش نەویستووە. جیاواز لەوە چی بەسەر خەڵکەکەی ئێمە هاتووە، ئێمە بەخۆیەوە سەرقاڵ بکات و گوڵی وشك وشك و لەیار و خۆشەویستی ئێمە جگە لەبیرەوەریەك بەجێ نەهێڵێت.

دڵڕەقانە گەنجەکەیان هێنا و لەملیاندا. ئەم شێعرە هی عەبدوڵڵە کوڕی عەلقەمەی کەنانییە کەلەمناڵەکانی جەزیمە بوو و ئەم شێعرەی سەبارەت بەحوبەیشەی کەنانی هۆنیوەتەوە.

جارێك، ئەو کاتەی کوڕێکی تازەپێگەیشتوبوو، لەگەڵ دایکی ڕۆشتەدەر تا ژنی دراوسێ ببینێت. ئەو کچێکی هەبوو بەناوی حوبەیشە کچی حوبەیش. کاتێك عەبدوڵڵە ئەوی بینی، عاشقی بوو و فریوێك لەنیگای شەرمەزاری لەقوڵایی دڵی ڕۆچوو. دایك لای ژنی دراوسێ مایەوە و عەبدوڵڵە بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە. دوای دوو ڕۆژ کەهات دایکی بباتەوە و بینی کەحوبەیشەی نازەنین بۆ

ڕۆشتن بۆ ئاهەنگێك لەدیٚ، خۆی رازاندۆتەوە. شەیدابوونی بەکچەکە سەد بەرابەر زیادی کرد. دایك گەڕایەوە و ئەو بەدوایدا ڕۆشت و بەردەوام دەیوت:

| | |
|---|---|
| و ما ادری بلی انی لادری | اصوب القطر احسن ام حبیش |
| حبیشة و الذی خلق البرایا | و ما ان عندنا للصب عیش |

واتاکەی: نازانم، بەڵام بەراستی دەزانم، ئایا بارینی باران لەبەهاران خۆشترە یا حوبەیش ئەو مانگە تابانە لەناو کچان. سوێند بەوەی خەڵکانی ئافراندووە حوبەیشە باشترە، من دوای گرفتار بوون لەعەشقی ئەو ژیانم نەماوە.

دایکی ئەم وتارەی بیست و چاوی لیٚ پۆشی. دواتر ئاسکێکی لەسەر تەپۆڵکەکە بینی و ئەمەی وت:

| | |
|---|---|
| یا امنا خبرینی غیر کاذبة | و ما یرید سوول الحق بالکذب |
| اتلك احسن ام ظبی برابیة | لابل حبیشة فی عینی و فی اربی |

واتاکەی: ئەی دایکە، پێم بڵیٚ و درۆ مەکە چوونکە ئەوەی لەراستی و دروستی دەپرسێت، خوازیاری درۆ نییە. ئایا ئەو دڵدارە نازەنینە جوانترە یا ئاسکێکی ڕەم کردوو لەسەر تەپۆڵکە؟ نا، بەڵکو حوبەیشە لای من زۆر جوانترە.

دایکی ئەوی دوورخستەوە و وتی: تۆ کارت بەم کارانە چییە؟ من کچە مامەکەتم کردۆتە هاوسەری تۆ کەلەجوانترین ژنانی جیهانە. ئەو ڕۆشتە لای عومەیر و ئەمەی بۆ گێڕایەوە و وتی: کچەکەتی بۆ جوان بکە. ئەم کارەی کرد و ئەو جوان روخسارەی بردە لای کچەکە. کوڕەکە سەری بردەپێش. دایکی وتی: ئێستا بڵیٚ کامیان جوانترن. ئەو وتی:

| | |
|---|---|
| اذا غیبت عنی حبیشة مرة | من الدهر لا املك عزاً و لا صبرا |
| کان الحشا حر السعیر تحسه | و قود الغضاو القلب مضطرم جمرا |

واتاکەی: ئەگەر لەسەراسەری رۆژگار، حوبەیشە بۆ یەك سات لەبەر چاوی من نەمێنێت، نەدەتوانم ئارام بم و نەخۆڕاگر. دەڵێی لەناخی من ئاگرێك هەڵکراوە بەشێوەیەك داری (غەزای) سوتاندبێت و ئاگری خستبێتە سەرجەرگی من. ئاگر لەناخی من بڵێسە دەسەنێت.

ئەو دەستی بەناردنی پەیك و پەیام بۆ لای کچەکە کرد و کچەکە پەیك و پەیامی

بۆ دەنارد. ئەو عاشقی کچەکە بوو و کچەکەیش. شاعیرەکان لەمبارەوە بەفراوانی شیعریان هۆنیوەتەوە. لەوان:

حبيشة جدى و جدك جامع بشملكم شملى و اهلكم اهلى

وهل انا ملتف بثوبك مرة بصحراً بين الالبتين الى النحل

واتاکەی: ئەی حوبەیشە، بەختی من وتۆ کەسەکانمان دەگرێتەوە ئەو کاتەی لەدەورمان کۆببنەوە یا بلاوەی لێبکەن. بنەماڵەی تۆ بنەماڵەی منیشە. ئایا یەك جار وارێکەوت من خۆم لەناو بیابان لەنێوان (ئەلبتین) تا دەشتی (نەحل) لەجلەکانی تۆ بئاڵێنم و تۆ لەئامێز بگرم؟

کاتێك کەسەکانی کچە لەمە ئاگادار بوونەوە، ئەویان لەکوڕەکە داشارد بەلاّم شەیدابوونی زیادی کرد. بەکچەکەیان وت: ژوانی لەگەڵ ببەستە و کاتێك هاتە لای تۆ پێی بڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێت دەبێت بزانیت لەسەرراسەری زەوی کەس بەئەندازەی من لەتۆ بێزار نییە. ئێمە لەنزیکەوە دادەنیشین و گوێ دەگرین کەتۆ چی دەڵێیت. کچەکە ژوانی لەگەڵ بەست و کەسانی بنەماڵەکەی لەنزیك ژوانگە دانیشتن و خۆیان داشارد. کاتێك کچەکە لێی نزیکبوویەوە، چاوەکانی پڕ بوولەفرمێسك و رووی بۆ شوێنی بنەماڵەکەی خۆی گەڕاندەوە کەلێی دانیشتبوون. کوڕەکە زانی ئەوان لەوێن، بەنهێنییەکەی زانی و وتی:

فان قلت ما قالوا لقد زدتنى جوى على انه لم يبق سرولاستر

ولم يك حتى عن فواك بذلته فيسلبنى عنك التجنب و الستر

و ما انس ملاشياء لا انس و مقها ونظرتها ختى يغيبنى القبر

واتاکەی: ئەگەر ئەوەی ئەوان فەرمانیان پێ کردوویت بێنیتە سەرزمان، تەنیا ئاگری دڵ و شەیدایی من زیاد دەکەیت. ئێستا ئیتر نەرازێك بەنهێنی ماوەتەوە و نەپەردەیەك بەنەدڕاوی. هەرچی بینێتە سەرزمان، هەرچەند لەدڵەوە قسە بکەیت، نابێتە هۆی ئەوەی خۆپارێزی و دوری تۆ، تۆ لەمن بستێنێتەوە. لەدیاردەکانی ئەم جیهانە هەرچی لەبیر بکەم، دڵدانم بەتۆ و نیگایی ئاگرباری تۆ، تا ئەو کاتەی خۆڵ جەستەی من دادەپۆشێت، لەبیر ناکەم.

لەدوای ئەمە بوو پێغەمبەر(د.خ) خالید کوڕی وەلیدی بۆ شەڕی بنەماڵەی ئەو دودڵدارە نارد و ئەوەیان لێ بەسەرهات کەئامارژەمان پێدا.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) مەلیکەی لەیسی کچی داوودی کردە هاوسەری خۆی. باوکی ئەو لەرۆژی گرتنی مەککە لەناو خاك و خوێن گەوزابوو. هەندێك لەهاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) هاتنە لای ئەم ژنە جوانە و وتیان: پێت عەیب نییە پەیوەندی هاوسەری لەگەڵ کەسێك دەبەستیت کەباوکتی بەڕیسوایی کوشت؟ کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای و ویستی لەگەڵی بخەوێت، ئەو خۆی نەدا بەدەستەوە، نازی کرد و وتی: پەنا بەرخوا. پێغەمبەر(د.خ) لێی جیابوویەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا پێنج ڕۆژ بۆ کۆتایی ڕەمەزان /١٦ ژانویەی ٦٣٠ زایینی خالید کوڕی وەلید لەناو باخێکی دارخورما، عوزای تێکشکاند. هەموو خەڵکانی قورەیش و موزێر و کەنانە ئەم ماڵەیان بەبەرێز دادەنا. خزمەتکارانی ئەم بتکەدە مناڵەکانی شەیبان کوڕی سولەیم هاوپەیمانانی مناڵەکانی هاشم بوون. کاتێك سەرپەرەستی ئەوان لەهاتنی خالید کوڕی وەلید ئاگادار بوویەوە، شمشێرەکەی بەملی عوزاوە هەڵواسی و وتی:

اعز شدى شدة لاشوى لها　　　　علی خالد القی القناع و شمری

واتاکەی: ئەی عوزا هێزێك نیشان بدە و هێرشبکە کە سستی تیا نەبێت، هێرش بکەسەر خالید، ڕۆپۆش فڕێدە ودەست لەقۆلت دەربێنە.

کاتێك خالید گەشتە ئەوێ سەرپەرەستی بتخانەکە بەردەوام دەیوت: ئەی عوزا کەمێك لەتورەیی خۆت نیشان بدە. لەم کاتەدا ژنێکی حەبەشی و ڕەش، بەدەم گریان، بەڕووتی رایکردەدەر. خالید ئەوی کوشت و بتەکەی شکاند و بتخانەکەی وێران کرد و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و ئاگاداری کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو ژنە عوزا بوو کەئیتر هیچ کات پەرەستش ناکرێت.

هەروەها لەم ساڵەدا، عەمرۆ کوڕی عاس بتی (سواعی)لەبتخانەی هوزەیل لەناو برد. کاتێك بتەکەی دەشکاند، سەرپەرەستی بتخانەکە باوەڕی هێنا.

لەم ساڵەدا سەعد کوڕی زەیدی ئەشهەلی بتی مەناتی لەموشەلەل تێکشکاند.

## شەڕی هوازن لەحەنین

ئەم شەڕە لەشەوال/فەوریەی ٦٣٠ ڕوویدا. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك خەڵکی هوزان بیستیان خواوەند، مەککە بۆ پێغەمبەر(د.خ) گەڕاندۆتەوە،مالك کوڕی عەوف نەسری کوڕی معاویە کوڕی بەکر ئەوانی کۆکردەوە، ئەوان خۆیان ترسا بوون کەپێغەمبەر(د.خ) دوای گرتنی مەککە مەبەستی شەڕی ئەوان بکات. وتیان: هیچ ڕێگرێك نییە تا ئەو بۆ شەڕی ئێمە پەلە نەکات. بۆچوونی ڕاست ئەوەیە ئێمە هێرش بکەینە سەر ئەو پێش ئەوەی ئەو بێتە شەڕی ئێمە. پیاوانی سەقیف بەسەرکردایەتی قارب کوڕی ئەسوەد کوڕی مەسعود سەروەری هاوپەیمانان و زولخومار سوبەیع کوڕی حارس و براکەی ئەحمەر کوڕی حارس سەروەری مناڵەکانی مالك لەدەوری کۆبوونەوە. لەهۆزی قەیس عەیلان جگە لەنەسر و جوشم وسەعد کوڕی بەکر و چەندین دەستە لەمناڵەکانی هیلال ئامادە نەبوون. هەروەها نەهۆزی کەعب هات نە کەلاب. لەناو مناڵەکانی جوشم دورەید کوڕی سیمە بوو. ئەو پیرەپیاوێکی بەتەمەن کەنەیدەتوانی هیچ کارێك بکات جگە لەوەی کەسانێتر ویستیان بۆچون و هزری ئەویان لەگەڵدا بێت. کەسێکی بەئەزمون بوو.

کاتێك مالیك کوڕی عەوف بڕیاریدا بڕواتە شەڕی پێغەمبەر(د.خ)، ژنان و سامانەکانی خەڵکی لەگەڵ ئەوان کۆکردەوە. کاتێك لە ئەوتاس دابەزین، خەڵکی لەشوێنێك کۆکردەوە و دورەید کوڕی سیمە هاوڕێیان بوو. دورەید وتی: ئێستا لەکام دۆڵەدان؟ وتیان: لەئەوتاس. وتی: شوێنی هێرش بردنێکی باشە بۆ ئەسپەکان، نەبیابانێکی ناڕێکە نەدەشتێکی خۆڵ، بۆ ناڵەی وشتر و زەڕزەڕی کەر وباعەباعی مەڕ و گریانی مناڵان دەبیستم؟ وتیان: مالك ئەمانەی کردۆتە هاوڕێی خەڵك. وتی: ئەی مالك، ئەمڕۆ بەیانی هەیە، بۆ ئەم کارەت کرد؟ وتی: ئەمانەم کردە هاوڕێی خەڵك تا هەرکەس بۆ بەرگری کردن لەکەس و کار و سامانەکەی خۆی شەڕ بکات. دورەید وتی: شوانێکی بزنیت و بەس. ئایا تێکشکاو دەتوانێت شتێك بگەڕێنێتەوە؟ ئەگەر شەڕ لەبەرژەوەندی تۆبێت جگە لەپیاوێك بەشمشێر و ڕمەکەی بەهای بۆ تۆ نەبێت و ئەگەر لەزیانی تۆ بێت، لەبەرابەر ژن ومناڵەکەی خۆت ڕیسوا

بوویت و سامانەکەت لەدەستت دەڕوات. دوبارە دورەید پرسی: کەعب و کەلاب چییان کرد؟ وتیان: هیچ کامیان پەیوەستی ئەم سوپایە نەبوون. دورەید وتی: بەختمان نەما و تیژی شمشێر بەرەو کولی ڕۆشت. ئەگەر ئەم شەڕە لەسەر بنەمای شەرەف و سەرفرازی بوایە، کەعب و کەلاب پاشەکشێیان نەدەکرد. دواتر وتی: ئەی مالك، ژن و منداڵەکان سوار ئەسپ بکە و بیانگەڕێنەرەوە. ئەگەر شەڕ لەبەرژەوەندی تۆ کۆتایی بێت، ئەوان کە لەپشت سەری تۆن پەیوەستت دەبن و ئەگەر لەزیانی تۆ، بنەماڵە و سامانەکەت لەزیان دوورخستۆتەوە. مالك وەڵامی دایەوە: سوێند بەخوا ئەم کارە ناکەم. تۆ پیربوویت و زانستەکەت ڕووی لەپیری و خڵەفاوی کردووە. بەخوا سوێند ئەی هوازنییەکان، یا بێ چەند و چون فەرمان لەمن وەردەگرن یا بێگومان پشت بەم شمشێرەوە دەدەم تا سەرەکەی لەپشتم بێتەدەر. ئەو پەسەندی نەکرد دورەید لەفەرماندەیی بەشدار بێت. دورەید وتی: ئەمە ڕۆژێکە هاوتاییم نەبینیوە و سەرئەنجامەکەی لەمن شاراوەیە. دواتر مالك هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، کاتێك ڕووبەڕووی ئەوان بوونەوە، کاڵانی شمشێرەکانی خۆتان بشکێنن و وەك پیاوێکی تاقانە هێرش بکەنە سەریان.

مالك دیدەوانەکانی خۆی ڕەوانە کرد تا لەبارودۆخ ئاگاداری بکەنەوە. ئەوان بەشێوەیەك بەربلاو گەڕانەوە دەتوت جومگە جومگەیان پچڕابوو. مالك پرسی: چیتان بەسەر دێت؟ وتیان: پیاوانێکی سپیمان لەسەر ئەسپی ڕەش و سپی بینی. سوێند بەخوا کەمێك زیاتر درەنگمان نەکرد کەئەوەی دەیبینی بەسەرمان هات! ئەم کارە ڕێگەی لێنەگرت تا واز لەخواستەکەی بێنێت.

کاتێك هەواڵی هوازن بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت، مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوانی کرد. پێیان وت لای سەفوان کوڕی ئومەییە بڕێك زرێ و کەلوپەلی شەڕی لێیە. پێغەمبەر(د.خ) کەسێکی نارده لای ( و ئەو لەم ڕۆژەدا بتپەرەست بوو)، وتی: کەلوپەلەکانی خۆت بەقەرز بدە بەئێمە تا ڕووبەڕووی دوژمن ببینەوە. سەفوان پێی وت: ئەی محەممەد ئایا بەزۆر وەریدەگریت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: وەك قەرز کەبەڵێن دەدەین بۆتۆی بگەڕێنینەوە. سەفوان وتی: ترسم نییە. ئەو سەد زرێ و ژمارییەك کەرەستەی شەڕی بەپێغەمبەردا. دواتر پێغەمبەر(د.خ) هاورێ لەگەڵ دوو

هەزار تازە باوەڕ هێنەری ڕۆژی گرتنی مەککە و دەهەزار کەس لەهاوڕێکانی خۆی ڕەوانە بوو و ژمارەی سوپاکەی گەشتە دوانزە هەزار کەس. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) زۆری سوپاکەی خۆی بینی، وتی: ئەمڕۆ کەمی هێز ئێمە گیرۆدەی شکەست ناکات. ئەمە ئەوەیە خوای گەورە لەم ئایەدا باسی دەکات: خوا ئێوەی لەگۆڕەپانە جیاوازەکان هاوکاری کرد. و لەشەڕی حونەین ئەو کاتەی زۆری هێزەکەتان ئێوەی فریودا بەلاَم زۆربوونی ژمارەی سوپا بەکەڵکتان نەهات و زەوی بەو هەموو فراوانییەوە بۆ ئێوە تەنگ و ئێوە هەلاَتن. دواتر خوا بۆ پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕداران ئارامی نارد و سوپایەکی نارد کەئێوە نەتانبینی. و ناباوەڕانی ئەشکەنجە کرد و سزای ناباوەڕان ئەمەیە (توبە/٩/٢٥-٢٦). دەستەیەك دەڵێن ئەوە قسەی پیاوێکی بەکرییە.

پێغەمبەر(د.خ) عەتاب کوڕی ئوسەیدی وەك فەرمانداری مەککە دیاری کرد. جابر دەڵێت: کاتێك ڕوومان لەدۆڵی حونەین کرد، بەرەو دۆڵێکی قوڵ و سەرەوخوار تل بووینەوە و لەتاریکی و کوێری بەرەبەیانی دەڕۆشتین. ئەوان پێش ئێمە خۆیان گەیاندبووە دۆڵەکە و لەهەر سوچ و قوژبنێکا خۆیان داشاردبوو. دوژمنان بەباشی ڕیزیان بەستبوو و بۆ شەڕێکی قورس خۆیان ئامادە کردبوو. سوێند بەخوا هێشتا بەتەواوی ئاگامان لەخۆمان نەبوو و دەڕۆشتین کەلەناکاو دەستەیەك شەڕکەر هاوشێوەی پیاوێکی تاقانە هێرشیانکردە سەرمان. خەڵك هەمووی هەلاَتن وکەس ئاوڕی لەکەس نەدایەوە. پێغەمبەر(د.خ) ڕوویکردە لای ڕاست و دواتر بانگیدا: ئەی خەڵکینە بەرەو لای من وەرن، من پێغەمبەری خوام. من محەممەد کوڕی عەبدوللەم. ئەمەی سێ جار بەدەنگی بەرز بەخەڵك وت. ئەوسا وشتەرکان پێش یەك دەکەوتن و جگە لەدەستەیەك لەموهاجیر و ئەنسار و کەسانی پێغەمبەر(د.خ) لای ئەو نەمانەوە، لەوان: ئەبووبەکر، عومەر، عەلی، عەباس، کوڕەکەی فەزل، ئەبوسوفیان کوڕی حارس، ڕەبیعە کوڕی حارس، ئەیمەن کوڕی دایکی ئەیمەن و ئوسامە کوڕی زەید. دەڵێت: پیاوێك لەهوازن سوار لەسەر وشترێکی مووسوور، ئالاَیەکی ڕەش لەدەست لەپێش خەڵکەوە پەلاماری دەدا. کاتێك ڕووبەڕووی کەسێك دەبوویەوە، دەیکوشت و ئەوسا ئالاَکەی خۆی هەڵدەکرد. عەلی ڕووبەڕووی بوویەوە و ناردی

بۆ ئەو دنیا.

کاتێک خەڵکان شکەستیان خوارد و هەڵاتن، پیاوانێک لەخەڵکانی مەککە دەستیان بەخستنە ڕووی کینە و ڕقەکانی خۆیان کرد. ئەبوسوفیان کوڕی حەرب کەتیری بردن و دۆڕاندنی لەدەستا بوو، وتی: پێش گەشتن بەدەریا، شکست ناخۆن. کەلدە کوڕی حەنبەل زڕبرای سەفوان کوڕی ئومەییە (کەهێشتا بتپەرەست بوو) وتی:ئێستا جادو بەتاڵ بوویەوە. سەفوان وتی: بێدەنگ بە، خوا دەمت دەشکێنێت! سوێند بەخوا ئەگەر پیاوێک لەقورەیشییەکان سەروەری من بێت، باشترە لەوەی پیاوێك لەهوایزن ببێتە خواوەندی من. شیبە کوڕی عوسمان وتی: ئەمرۆ داغ لەدڵی محەممەد دەستێنم. باوکی لەشەڕی ئۆحۆد کوژرابوو. دەڵێت: ڕوومکردە پێغەمبەر(د.خ) تابیکوژم، بەڵام شتێك کەوتە دڵمەوە و نەمتوانی ئەو کارە بکەم.

عەباس لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) و هەوساری ئێسترەکەی، دوڵدوڵی لەدەستابوو. عەباس پیاوێکی چوارشانە و بەخۆوە بوو. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: ئەی عەباس جاڕبدە و بڵێ: ئەی دەستەکانی ئەنسار، ئەی پەیمان بەستووەکان لەژێر داری سەمورە! ئەو جاڕیدا و وەڵامیان دایەوە: هاتین، هاتین! بەرادەیەك بارودۆخەکە دژوار بوو کە گەڕاندنەوەی وشترێك ببووە کارێکی گران. لەبەر ئەمە شمشێری دەگرت و پیادە ڕووی لەشەڕ دەکرد. لەم کاتەدا سەد پیاوی شەڕکەر لەدەوری پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە و ئەو هاوڕێ لەگەڵ ئەوان ڕوویکردە دوژمنان و شەڕیان دەست پێکرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) قورس شەڕی بینی وتی:

انا النبی لا کذب　　　　　انا ابن عبدالمطلب

واتاکەی: من پێغەمبەرم و ئەم وتەیە درۆ نییە. من کوڕی عەبدولموتەلیبم.

ئەوسا وتی: ئاگردان گەرم بوو. ئەو یەکەم کەس بوو ئەم قسەی کرد. خەڵك بەقورسی هەرچی زیاتر شەڕیان کرد. پێغەمبەر(د.خ) بەئێسترەکەی خۆی دوڵدوڵی وت: ئەی دوڵدوڵ درەنگ بکە. ئەو سکی خۆی خستە سەر زەوی. پێغەمبەر(د.خ) مشتی خۆڵی هەڵگرت و پرژاندی بەڕوخساری هوازنییەکان. هەمان کات شکستی ئەوان دەستی پێکرد. خەڵك نەگەڕانەوە مەگەر ئەوەی بینیان ئەسیرەکان تەناف

لەدەست لەبەردەم پێغەمبەری خوادان. دەستەیەك دەڵێن: دیاردەیەكی ڕەش هاوشێوەی ڕووپۆشێكی ڕێ ڕێ لەئاسمانەوە هات و كەوتە گیانی دوژمن. لەناكاو مێروولە ڕەشەكان لەهەموو شوێنێك بڵاو بوونەوە و سوپای دوژمن شكەستی خوارد.

كاتێك بتپەرستەكانی هوازن شكەستیان خوارد، لەمالك و سەقیف حەفتا پیاو كوژران، لەهاوپەیمانان جگە لەدوو كەس نەكوژرا چوونكە ئەوان بەخێرایی ڕایان كرد. دەستەیەك لەبتپەرستەكان لەگەڵ مالك كوڕی عەوف ڕوویان لەتایف كرد و سوارەكانی پێغەمبەر(د.خ) شوێنیان كەوتن و بتپەرستەكانیان كوشتار كرد. ڕەبیعە كوڕی یەربووعی سولەمی، دورەید كوڕی سیممەی بینی، بەڵام ئەوی نەناسی چوونكە ئەویان لەبەر پیری و بەتەمەنی سوار كەژاوەكەی خۆی كردبوو. ئەو وشترەكەی خەواند و بینی پیرەپیاوێكە گوێ لەبن قەبرا دەلەرزێت. دورەید وتی: چیت دەوێت؟ ڕەبیعە وتی: دەمەوێت تۆ بكوژم. دورەید وتی: كێیت؟ وتی: ڕەبیعە كوڕی یەربوع. دواتر شمشێری بۆ داهێنا بەڵام نەیتوانی هیچ كارێك بكات. دورەید وتی: قێزەونە ئەو شێوەی دایكت تۆی بەكەرەستەی شەڕ ڕازاندۆتەوە. شمشێرەكەی من بگرە و بمكوژە. لەئێسقان ببیە سەر و لەمێشكی سەری بە. من بەم شێوە خەڵكانم دەكوشت. كاتێك ڕۆشتیتە لای دایكت بڵێ من دورەید كوڕی سیممەم كوشت. من چەندین جار پارێزگاریم لەژنەكانی ئێوە كردووە. ڕەبیعە بەدڵڕەقی هەرچی زیاتر ئەوپیرە پیاوە ناتەوانەی كوشت و كاتێك بۆلای دایكی گەڕایەوە و لەم ڕووداوە ئاگاداری كردەوە، دایكی وتی: سوێند بەخوا ئەو، سێ جار دایكی تۆی ئازاد كردووە. ئەبوتەڵحەی ئەنسار لەشەڕی حەنین بەتەنیایی بیست كوژراوی تالآن كرد. ئەو بیست كەسە بەدەستی خۆی كوژرابوو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: هەركەس دوژمنێك بكوژێت هەموو شتەكانی بۆخۆی بێت. ئەبوقتادەی ئەنساری پیاوێكی كوشت بەڵام نەیتوانی تالآنی بكات و كەسێكیتر ئەم كارەی كرد. كاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی وت، ئەبو قتادە هەستا و وتی: من كەسێكم كوشت و یەكیتر تالآنی كرد. ئەو كەسەی تالآنی كردبوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من كوژرام تالآن كرد، تۆ بكوژ لەمن ڕازی بكە. ئەبوبەكر وتی: سوێند بەخوا بەڕەوای نازانین تۆ ببیتە شەریكی یەكێك لەشێرەكانی خوا

کەلەرێگەی خوا شمشێر دەوەشێنێت. دواتر ئەو پیاوە کالاّ تالاّنکراوەکانی تەسلیمی ئەبوقتادە کردەوە.

یەکێك لەپیاوەکانی سەقیف کۆیلەیەکی مەسیحی هەبوو کەلەم شەڕەدا کوژرا. کاتێك یەکێك لەپیاوانی ئەنسار کوژراوەکانی تالاّن دەکرد، ئەو کۆیلەی رووتکردەوە و بینی خەتێنە نەکراوە. بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی عەرەبەکان بڕوانن سەقیفییەکان خەتێنە ناکەن. موغیەرە کوڕی شەعبە پێی وت: ئەمە مەڵێ، ئەو کۆیلەیەکی مەسیحییە. ئەو کوژراوە سەقیفیەکانی نیشاندا کەهەموویان خەتێنە کرابوون.

پێغەمبەر(د.خ) لای ژنێکی کوژراو تێپەڕی و پرسی: کێ ئەم ژنەی کوشتووە؟ وتیان: خالید کوڕی وەلید. ئەو بەیەکێك لەهاوەلاّنی وت: خالید بدۆزەوە و بڵێ لەکوشتنی ژن و منالّ و بەکرێگیراوان خۆبپارێزە.

دەستەیەك لەبتپەرستەکان لەئەوتاس بوون. پێغەمبەر(د.خ) ئەبوعامری ئەشعەری مامی ئەبوموسا ئەشعەری بۆ شەڕی ئەوان نارد. تیرێکیان لەم ئەبوعامرەدا و کوشتیان. وترا ئەم تیرە لەلایەن سەلەمە کوڕی دورەید کوڕی سیممە هاوێژرا. ئەبو موسا، سەلمەی لەتۆڵەی خوێنی مامەی کوشت. بتپەرستەکانی ئەوتاس شکستیان خوارد و هەلاّتن و موسڵمانان دەستیان بەسەر ژنان و سامانە تالاّنکراوەکاندا گرت. لەناو ئەسیرەکان شەیمە کچی حارس کوڕی عەبدولعوزەی بوو. وتی: سوێند بەخوا من خۆشکی شیری گەورەی ئێوەم. ئەویان بەراستگۆ نەزانی وبردیانە لای پێغەمبەر(د.خ). ژن وتی: من خوشکی تۆم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: نیشانەت چییە؟ ژن وتی: گازێك کەبەدیان لەپشتمت گرت و من تۆم خستبووە سەرشانی خۆم. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ناسییەوە و عاباکەی خۆی بۆ پان کرد و ئەوی لەسەر دانیشاند و ئازادی کرد و وتی: ئەگەر دەتەوێت لای من بەرێز و خۆشەویست بمێنەرەوە و ئەگەر نەتەوێت سامانت پێ دەدەم و بۆ لای خەڵکەکەت دەگەڕێنمەوە. شەیمە وتی: سامان و توێشوم پێبدە و بۆ لای خەڵکەکەم بگەڕێنەرەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەو کارەی کرد.

لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا ئەسیرەکان وسامانەکان لەجێعرانە

کۆبکەنەوە. ئەو بودەیل کوڕی وەرقای خەزاعی بۆ پاراستنیان ڕاسپارد.

لەشەڕی حەنین ئەیمەن کوڕی دایکی ئەیمەن و یەزید کوڕی زەمعە کوڕی ئەسوەد کوڕی موتەلیب کوڕی عەبدولعوزەی و کەسانیتر شەهید بوون.

## گەمارۆدانی تایف

کاتێک شکەست خواردووانی سەقیف و ئەو کەسانەی پەیوەستیان بوون، ڕۆشتنە تایف، دەروازەکانی شاریان بەڕووی خۆیاندا بەست و سەنگەریان گرت و پێداویستییەکانیان کۆکردەوە. پێغەمبەر(د.خ) بۆ جەنگی ئەوان بەڕێکەوت. پێش گەشتن بەتایف گەشتە (بحره الرغا ) لەوێ وەك تۆڵە پیاوێکی لەمناڵەکانی لەیس کوشت چوونکە پیاوێکی لەهوزەیل کوشتبوو و لەبەر ئەمە پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی کوشتنی دەکرد. ئەمە یەکەم خوێن بوولەئیسلام وەك تۆڵە ڕژا. ئەو ڕۆشتەلای سەقیفیەکان ئەوانی بۆ ماوەی بیست وچەند ڕۆژ لەتایف گەمارۆدا. ئەو بەبیرهێنانەوەی سەلمانی فارسی مەنجەنیقی دانا و بەو پەڕی هێزەوە شەڕی لەگەڵ کردن. کاتێك ڕۆژی شەڕی (شەرخە) گەشت، ڕۆشتنە ناو زرێ پۆشێك (تایبەت بەو ڕۆژگارە کەخۆیان دروستیان کردبوو. ئەوسا لەژێر پۆششی زرێپۆشەکە هێرشیان کردە سەر دیوارەکانی تایف. سەقیفییەکان ئاسنی تووآوەیان بەسەرا کردن و موسوڵمانەکان لەژێر زرێپۆشەکە هاتنەدەر. پیاوانی تایف تیربارانیان کردن و چەند کەسێکیان لێ کوشتن. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا ڕەزەکانی سەقیف ببڕن و ئەو کارەیان کرد. دواتر چەند پیاوێك لەکۆیلەکانی تایف هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) کەئازادی کردن. لەناویان ئەبوبەکرە بەقیع کوڕی حارس کوڕی کەلدە بوو. بۆیە پێیان دەوت ئەبوبەکرە چوونکە لەبەکرە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ). دواتر کاتێك خەڵکی تایف باوەڕیان هێنا، سەروەری ئەو کۆیلانە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسەیان کرد تا ئەوان بکەنەوە بەکۆیلە. پێغەمبەر(د.خ) وتی ئەو کارە ناکات چوونکە ئەوان ئازاد بووەکانی خوان.

دواتر خویلە سولەمی کچی حەکیم ژنی عوسمان کوڕی نەتعون وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر خوا تایفی بەتۆ بەخشی، زێڕ و زیوی بادیە کچی غەیلان

لەگەڵ زێڕ و زیوی قارغە کچی عەقیل بەمن بدە. ئەم دووانە لەجوانترین ژنان بوون. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی خویلە، چی گومان دەکەیت ئەگەر خوا فەرمانی بەمن نەدابێت تایف بگرم. خویلە ئەم قسەی گەیاندە عومەر کوڕی خەتاب. عومەر هاتە لای و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەم قسە چییە خویلە بەمنی وت کەتۆ پێت فەرمووە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەمەم وتووە. عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا جاری کۆچکردن لێنەدەم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەڵێ جاری کۆچکردن لێ بدە.

دەستەیەك دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ نەوفل کوڕی معاویە دوئەلی سەبارەت بەمانەوە لەسەر سەقیفییەکان ڕاوێژی کرد. وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ڕێوییەك لەکونێکدایە ئەگەر لەسەری بمێنیتەوە، دێتەدەر و ئەگەر بەرەڵای بکەیت، زیان لەتۆ نادات. فەرمان بدە خەڵك کۆچ بکەن. کاتێك خەڵك گەڕانەوە، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، خوا بۆسەر سەقیفییەکان بانگ بکە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی خوایە، سەقیفییەکان ڕێنوێنی بکە و ئەوان بێنە بۆ لای من. کاتێك سەقیفییەکان بینیان خەڵك کۆچ دەکەن، سەعد کوڕی عوبەیدی سەقیفی وتی: بزانن ئەم هۆزە دەمێنێتەوە. عۆیەیینە کوڕی حسن وتی: سوێند بەخول لەگەورەکان و ڕێزدارانن. پیاوێك لەموسوڵمانان وتی: ئەی عۆیەیینە خوا بتکوژێت، ئایا ئەوان وەسف دەکەیت کەلەبەرابەر پێغەمبەر(د.خ) خۆڕاگریان کرد؟ عۆیەیینە وتی: من بۆ ئەوە نەهاتووم هاوڕێ لەگەڵ ئێوە لەگەڵ سەقیفییەکان شەڕ بکەم بەڵکو دەمویست لەناو سەقیف کچێك بەدەست بێنم تا منداڵێکم بۆ بێنێتەدنیا چوونکە سەقیفییەکان پیاوانێکی بەهێزن.

لەتایف دوانزە کەس کوژران و لەوان: عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی ئومەییەی مەخزومی کەدایکی عاتکە کچی عەبدولموتەلیب بوو، عەبدوڵڵە کوڕی ئەبوبەکری سدیق کەتیری بەرکەوت و لەئازارەکەی لەمەدینە گیانی سپارد. مەرگی ئەو دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) بوو، هەروەها سایب کوڕی حارس کوڕی عودەی و هاوشێوەکانی.

بادیە کچی غەیلان کەناومان هێنا، ئەوکەسەیە پیاوێکی ژن ئاسا بەناوی هیت سەبارەت بەو بەعەبدوڵڵە کوڕی ئەبی ئومەییەی وت: ئەگەر خوا تایفی پێ بەخشین، داوا لەپێغەمبەر(د.خ) بکە بادیە وەك کەنیز بەتۆ ببەخشێت چوونکە

تایبەتمەندییەکانی ئەم ژنە ئەمانەن: نازەنینێکە کەمەر باریك، خۆش بزە، عەیار، ئێسك سوك، چاوانی مەست و گەورە کەئەگەر قسە بکات گۆرانی دەڵێت، ئەگەر هەستێت خەرامان دەڕوات، ئەگەر دەڕوات دەلەرزێت و ئەگەر دانیشێت وەك بینایەك دارمێت، چوارلایەنە خەرامان بۆ پێشەوە دێت و هەشت لایەنە بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، ددانەکانی وەك تەرزە سپی و لەنێوان دوو قاچی خۆی گلۆلەیەکی هاوشێوەی قاپێکی ئاوەژۆ داناوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: تایبەتمەندییە راستەکانت دیاری کرد. فەرمانیدا لەهاتنی ئەم هەرزە پیاوە بۆ لای ژنەکانی رێگری بکەن.

## دابەش کردنی تالأنییەکانی حەنین

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەتایف کۆچی کرد، ڕۆشت تا لەجێعرانە دابەزی. لەجێعرانە وەفدی نوێنەرایەتی هەوازین کەباوەڕیان هێنابوو، هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە بنەماڵە و بنچینەی تۆین و ئەوەمان بەسەر هاتووە کەلەتۆ شاراوە نییە. لەئێمە خۆشبە تا خوا لەتۆ خۆش بێت. زوهەیر کوڕی سورد لەمناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر( ئەو بنەماڵەی شیری بەپێغەمبەر(د.خ) دابوو) هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەباخی دارخورماکان، پوڕ و پەرستارەکانی تۆ دەژین. ئەگەر ئێمە شیرمان بەحارس کوڕی ئەبی شمر غەسانی یا نەعمان کوڕی مونزەر دابوو، بێ گومان چاوەڕوانی خۆشەویستی ئەوانمان دەکرد. تۆ باشترینی پەروەردە کراوانی. دواتر وتی:

امنن علینا رسول الله فی کرم　　　　فانك المرء نرجوه و ند خر

امنن علی نسوة قد عاقها قدر　　　　ممزق شملها فی دهرها غیر

واتاکەی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بەرێزداری و گەورەیی خۆت ئێمە ببەخشە چوونکە تۆ ئەو پیاوەیت هیوامان پێتە و بەپاشەکەوتی خۆمانی دەزانین. لەژنان ببەخشە کەچارەنوس رێگەی لێبەستون و دەستەکانیان بلأوبۆتەوە و ڕۆژگاریان ڕەش و تاریك.

ئەم قەسیدە چەندین بەیتی دوورودرێژە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی ئازاد کرد تا ژنان و مناڵەکانی خۆیان و سامانەکانیان وەربگرنەوە. ژن و مناڵەکانی خۆیان هەڵبژارد.

پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوەی بۆتە بەشی من و منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، بۆ ئێوەیە. کاتێک لەگەڵ خەڵک نوێژ دەکەم بڵێن: ئێمە پێغەمبەر(د.خ) دەکەینە ناوبژیوان لەگەڵ موسوڵمانان و موسوڵمانان دەکەینە ناوبژیوانی خۆمان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ). لەم کاتەدا من بەشی خۆم بەئێوە دەبەخشم و داوا لەخەڵک دەکەم بەهرەی خۆیان بۆ ئێوە بگەڕێننەوە. کاتێک بۆ نوێژی نیمەڕۆ وەستا و کۆتایی بەنوێژ هێنا، ئەوکارەیان کرد پێغەمبەر(د.خ) پێی وتبوون. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوەی بۆتە بەشی من و منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، بۆ ئێوەیە. موهاجیر و ئەنسار وتیان: ئەوەی بۆتە بەشی ئێمە، بۆ پێغەمبەرە. ئەقرەع کوڕی حابس وتی: ئەوەی بۆتە بەهرەی من و منداڵەکانی تەمیم، نایبەخشم. عۆیەیینە کوڕی حسن وتی: ئەوەی بۆتە بەشی من و منداڵەکانی فەزارە، نایگێڕمەوە. عەباس کوڕی میرداس وتی: ئەوەی بۆتە بەشی من و منداڵەکانی سەلیم نایگێڕمەوە. منداڵەکانی سەلیم وتیان: ئەوەی بۆتە بەشی ئێمە، بۆ پێغەمبەرە. عەباس کوڕی میرداس وتی: منتان ریسوا کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوانەی بەشی خۆیان لەدیلەکان راگرتووە (ئەگەر ئێستاکە ئازادیان بکەن) لەیەکەم تالآنی کەدەستمان گەوێت، شەش بەشیان بەردەکەوێت. کاتێك ئەمەی وت: ژنان و منداڵانیان بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) لەمالك کوڕی عەوف پرسی. پێیان وت: ئێستا لەتایفە. وتی: پێی بڵێن ئەگەر باوەڕ بێنێت و بێتە لای من، کەسەکان و سامانەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە و سەد وشتریشی پێ دەدەم. ئەوان مالکیان لەم وتەیە ئاگادار کردەوە. ئەو بەنهێنی لەتایف هاتەدەر و پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بوو و باوەڕی هێنا. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە سەرکردەی خەڵکەکەی خۆی و باوەڕدارانی هۆزەکانی دەوروبەری تایف و ژن و منداڵ و سامانەکەی بۆ گەڕاندەوە و سەد وشتری پێبەخشی. ئەو لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێنا بوو( و هەموویان لەهۆزەکانی سوماڵە، فەهم و سەلەمە بوون) لەگەڵ سەقیفییەکان شەڕی دەکرد. هەرجار کەمەڕوماڵاتەکەی خۆیان بۆ لەوەڕین دەهێنایەدەر، هێرشیدەکردە سەریان و تالآنی دەکردن تا ئەوەی ژیانیان لەسەریان دژوار بوو.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەدانەوەی ئەسیرەکانی هوازین تەواو بوو، سوار بوو،

خەڵك شوێنی کەوتن و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بەشی ئێمە بەسەرمانا دابەش بکە. ئەویان بۆ لای دارێکەوە برد و عاباکەیان دزی. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی خەڵکینە، عاباکەم بۆ بگەڕێنینەوە چوونکە سوێند بەخوا ئەگەر بەئەندازەی هەموو دارەکانی تەهامە مەڕ و ماڵات و چوارپێم هەبێت، بەسەر ئێوەدا دابەشی دەکەم و ئێوە من بەرژد و درۆزن و ریسوا نابینن.

دواتر گلۆڵەیەکی پەشمی لەکۆپانی وشترێك هەڵگرت و وتی: من لەتاڵانییەکانی ئێوە و لەم گلۆڵە پەشمە زیاتر لەپێنج یەك نییە کەدەیگەڕێنمەوە بۆ ئێوە. دواتر بە( دڵنەرم بووەکان) بەهرەی ئەوانی بەخشی. ئەوان سەروەرانی خەڵك بوون و مەبەستی لەبەخشش بەسەر ئەوان ئەوە بوو دڵی ئەوان بۆ باوەڕ هێنان نەرم بکات. لەناو ئەواندا بە ئەبوسوفیان و معاویەی کوڕی، حەکیم کوڕی حزام، عەلا کوڕی جاریەی سەقەفی، حارس کوڕی هوشام، سەفوان کوڕی ئومەییە، سوهەیل کوڕی عەمرۆ، حویتەب کوڕی عەبدولعوزی، عۆیەیینە کوڕی حسن، ئەقرەع کوڕی حابس و مالك کوڕی عەوف، هەرکام سەد وشتری بەخشی و کەمتر لەسەد وشتری بەکەسانیتر دا وەك: مەخرەمە کوڕی نەوفل زوهری، عومەیر کوڕی وەهب، هوشام کوڕی عەمرۆ و سەعید کوڕی یەربوع. بەعەباس کوڕی میراس چەند وشتری پێنج تا نۆساڵەی دا. ئەو توڕە بوو و وتی:

و کانت نهابا تلافیتها — بکری علی المهر فی الاجرع

و ایقاظی القوم ان یرقدوا — اذ اهجع الناس لم اهجع

فاصبح نهبی و نهب العبیـ — ـد بین عیینة و الاقرع

وقد کنت فی الحرب ذاتدرا — فلم اعط شیئا و لم امنع

والا افائل اعطیتها — عدید قوائمها الاربع

و ما کان حصن و لا حابس — یفوقان کرداس فی المجمع

واتاکەی: سامانەکان تاڵان کرابوون کەسوار ئەسپە گەنجەکەی خۆم بووم و لەبیابان غارمدا و ئەوانم بەدەست هێنا. نەمهێشت هاوتاکانم بخەون و کاتێك خەڵکان خەوتن، من بەئاگا مامەوە. ئێستا، ئەوەی من فڕاندبووم، لەگەڵ ئەوەی کۆیلەیەکی پەست فڕاندبووی، بەیەکسانیان زانی و کردیان بەشی عۆیەیینە و

ئەقرەع و لەناو ئەم دووانەدا دابەشیان کرد. من لەشەڕەکان هێرشم دەبرد و ئێستا نەبەهرەیان پێدام نە بێ بەهرەیان کردم. جگە لەچەند وشترێکی پیر بەژمارەی قاچەکانی ئەوان کەبەمنیان بەخشی و منیان پێ سەرقاڵ کرد. حەسەن و حابس لەکۆڕەکانی خۆیان لەباوکی من بەرێزتر و لەپێشتر نەبوون. من خۆیشم لەو دووانە کەمتر نەبووم بەڵام هەرکەس ئەمڕۆ بەسوك سەیری بکەیت، سبەی پایەبەرز نابێت.

پێغەمبەر(د.خ) بەخششەکەی بۆ زیاد کرد و ڕەزامەندی ئەوی بەدەست هێنا.

پیاوێك لەئەنسار وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بەخششت بەسەر عۆیەیینە و ئەقرەع کرد و جۆعەیل کوڕی سوراقەت لەبیر کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: سوێند بەوکەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، ئەگەر سەراسەری زەوی پڕ بێت لەپیاوانی وەك ئەقرەاع و عۆیەیینە، جۆعەیل کوڕی سوراقە لەوان باشتر دەبێت. بەڵام ویستم دڵی ئەو دووانە بۆ باوەڕ هێنان نەرم بکەم و لەبەر ئەمە جوعەیلم لەگەڵ ئیسلامەکەی لەبیر کرد.

دەڵێن: زونەلخویسرەی تەمیمی سەبارەت بەم بەخششە بەپێغەمبەری وت: کرداری ئەمڕۆی تۆ لەڕووی دادپەروەرییەوە نەبوو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر من بەداد کردار نەکەم، کێ دەتوانێت ئەو کارە بکات؟ عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئایا ئەو نەکوژین؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: وازی لێ بێنن کەئەو شوێنکەوتووانێکی زۆر هەیە و ماوەیەك دواتر وەك تیرێك کەلەکەوان دەرچێت، لەدین دەڕۆنەدەر ( و ئەوانە خەواریجەکان بوون کە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب شەڕیان کرد). دەستەیەك دەڵێن: ئەم وتەیە سەبارەت بەسامانەکەی ئەوبوو کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب لەیەمەنەوە بۆ پێغەمبەری نارد و ئەو لەناو دەستەیەك دابەشی کرد کەلەناویان عۆیەیینە و ئەقرەع و زەید ئەلخەیل بوون.

ئەبوسەعید خدری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەو سامانە فراوانەی لەناو قوڕەیش و هۆزە عەرببیەکان دابەش کرد و هیچی بەئەنسار نەدا، ئەوان لەناخەوە خەمبار بوون تا ئەوەی یەکێك لەوان وتی: پێغەمبەر(د.خ) چاوی بەخەڵکەکەی خۆی کەوت و ئێمەی لەبیر کرد. سەعد کوڕی عیبادە ئەم وتارەی گەیاندە پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی سەعد تۆ لەکوێیت؟ وتی: من لەگەڵ

خەڵکەکەی خۆمم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: کەواتە خەڵکەکەتم بۆ کۆبکەرەوە. سەعد ئەوانی کۆکردەوە و پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای ئەوان و وتی: ئەمە چ وتارێکە لەئێوەم بیستووە؟ ئایا گومڕاکان نەبوون کەمن هاتم و خوا ئێوەی بەهاوکاری من ڕێنوێنی کرد؟ هەژارەکان نەبوون کەخوا بەهاوکاری من ئێوەی بەتوانا کرد؟ دوژمنی یەکتر نەبوون کەخوا بەهۆی منەوە ئاشتی لەناودا سەقامگیر کردن؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەر(د.خ)، خوا و پێغەمبەرەکەی لەم کارەدا زۆریان بەئێمە بەخشیوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئایا وەڵامم نادەنەوە. وتیان: بە چ وتارێك وەڵامت بدەینەوە؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر بتانەوێت دەتوانن بڵێن ( و لەم کاتەدا ڕاستگۆ بن) کە: تۆیان بەدرۆزن دانا و تۆ هاتیتە لای ئێمە و ئێمە تۆمان بەڕاستگۆ زانی، تەنیا بوویت و ئێمە تۆمان هاوکاری کرد، دەرکراو بوویت و ئێمە پەنامان دایت، ئانخۆری زۆربوو و ئێمە سامانی خۆمان لەگەڵ تۆبەش کرد. ئەوسا وتی: ئەی ئەنسار، ئایا لەناخی خۆتان بۆ سامانی ئەم دنیایە هیلاك دەبن کە من دڵی دەستەیەکم پێ نەرم کرد تا باوەڕ بێنن و ئێوە لەگەڵ باوەڕ و ئیسلامەکەتان لەبیر کرد؟ ئایا ڕازی نین خەڵك مەڕ و وشتر ببەن و ئێوە بەئیسلامەوە بۆ ماڵەوە بگەڕێنەوە؟ سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، ئەگەر کۆچ کردن بۆ مەککە لەئارادا نەبوایە، من پیاوێك دەبووم لەئەنسار. ئەگەر خەڵك بەڕێگایەکدا بڕۆن و ئەنسار بەڕێگەیەکیتردا، من بەدوای ئەنسار دەڕۆم. خوایە، لەئەنسار و منداڵەکانی ئەنسار و منداڵی منداڵەکانی ئەنسار خۆشبە. دەڵێت: خەڵك بەشێوەیەك گریان ڕیشیان تەڕبوو. هەموویان وتیان: پێغەمبەر(د.خ) بەش و بەهرەی ئێمەیە، ئێمە بۆ هەمیشە بەسمانە، ئێمە پێی شادمانین، ئەوسا بڵاوەیان لێکرد.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) لەجێعرانە ئاهەنگی عەمرەی کرد و عەمرەی بەجێهێنا و گەڕایەوە بۆ مەدینە. ئەو عەتاب کوڕی ئوسەیدی کردە فەرمانڕەوایی مەدینە و مەعاز کوڕی جەبەلی کردە هاوڕێی تا خەڵکان فێری زانستی دین بکات. لەم ساڵەدا ئایینی حەج کردن عەتاب کوڕی ئوسەید بۆ خەڵکی ئەنجامدا. ئەو لەو ساڵەدا بەهەمان شێوە حەجی کرد کەعەرەبەکان دەیانکرد. پێغەمبەر(د.خ) لەزیحەجەجە یا زیقەعدە /مارس- ئاوریل ٦٣٠ زایینی بۆ مەدینە گەڕایەوە.

## ڕووداوەکانیتری ئەم ساڵە

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی عاسی بەرەو جەیفر و عەیاز کوڕانی جولەندی بۆ عەممان ڕەوانە کرد تا زەکات کۆبکاتەوە. ئەو زەکاتی لەدەوڵەمەندەکانی ئەوێ کۆکردەوە و بەسەر هەژاران دابەشیکرد. لەئاگرپەرستان باجی وەرگرت. ئەوان خەڵکانی ڕەسەنی شارەکە بوون و عەرەبەکان لەدەوروبەریان دەژیان. دەستەیەك دەڵێن: ئەم کارە لەساڵی حەوتەم /٦٢٨-٦٢٩ زایینی ڕوویدا.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) کچێکی کەلابی کردە هاوسەری خۆی کەفاتیمە کچی زوحاك کچی سوفیان بوو. ئەو زێڕ و زیوی ئەم جیهانەی بەلەپێشتر لەپێغەمبەر(د.خ) دانا. دەستەیەك دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەماڵەوە لەگەڵی بەتەنیا مایەوە و لێی نزیکبوویەوە و ویستی لەگەڵی بخەوێت، وتی: پەنا بەخوا، پێغەمبەر(د.خ) و ئەم کارانە!. پێغەمبەر(د.خ) خۆی لێ دوورخستەوە.

لەم ساڵەدا لەزیحەججە/ئاوریلی ٦٣٠ زایینی، ماریە، ئیبراهیم کوڕی پێغەمبەری هێنایە دنیا. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی دایە دەست دایکی بەردەی ئەنساری تا شیری پێبدات. مێردەکەی بەرائ کوڕی ئەوسی ئەنساری بوو. پەرستارەکەی سەلمی کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ)بوو. دایکی، کوڕی ئەبورافعی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد تا مژدەی کوڕێکی پێ بدات. پێغەمبەر(د.خ) کۆیلەیەکی وەك مژدانە پێبەخشی. ژنانی پێغەمبەر(د.خ) لەوەی بیینان ماریە کوڕی بووە بەتەواوی ڕژدیان پێبرد و ئەم ڕووداوەیان پێ ناخۆش بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) کەعب کوڕی عومەیری بۆ سەرزەمینی (ذات اطلاح) لەشام نارد تا بڕواتە لای دەستەیەك لەهۆزی قوزاعە وپێشنیاری ئیسلامیان پێ بکات. پێغەمبەر(د.خ) پانزە پیاوی لەگەڵ نارد. ئەو گەشتە لای ئەوان و داوای کرد باوەڕ بێنن، بەڵام ڕازی نەبوون. ڕێبەرەکەیان پیاوێك بوو بەناوی سەدوس. ئەوان موسوڵمانانیان کوشتار کرد و عومەیر ڕزگاری بوو و بۆمەدینە گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا عۆیەیینە کوڕی حسنی فەزاری بۆلای مناڵەکانی عەنبەر لەتەمیم ڕەوانە کرد. ئەو هێرشیکردە سەر ئەوان و ژنەکانی بەدیلی گرت. عایشە

پەیمانێکی بەستبوو کەیەکێك لەکۆیلەکان لەمناڵەکانی ئیسماعیل لەرێگەی خوادا ئازاد بکات، پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: ئەوانەی لەمناڵەکانی عەنبەر بەدیلی گرتومانن، دێن بۆ شار، کۆیلەی ئێمەن. یەك لەوان بەتۆ دەبەخشم تا لەرێگای خوا ئازادی کەیت.

## ڕووداوەکانی ساڵی نۆیەمی کۆچی( ٦٣١ زایینی )

## باوەڕ هێنانی کەعب کوڕی زوهەیر

دەڵێن: کەعب کوڕی زوهەیر کوڕی ئەبسی سولمەی و باوکی سولمەی رەبیعەی مەزنی لەگەڵ براکەی بوجەیر هاتنەدەر و بەرێکەوتن تا گەشتنە ئەبەرق ئەلعەزاف. بوجەیر پێی وت: لای مەڕەکانی ئێمەبە تا بڕۆینە لای ئەم پیاوە( پێغەمبەر(د.خ)) و گوێ لەقسەکانی بگرین. کەعب مایەوە و بوجەیر ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) وباوەڕی بەئیسلام هێنا. ئەم هەواڵە بەگوێی کەعب گەشت و ئەمەی وت:

| | |
|---|---|
| الا ابلغا عنی بجیرا رسالة | علی ای شی ویب غیرك دلكا |
| علی خلق لم تلف اما و لا ابا | علیه و لم تدرك علیه اخا لكا |
| سقاك ابوبكر بكاس روية | فانهلك المامور منها و علكا |

واتاکەی: پەیامێك لای من بۆ بوجەیر ببەن و بڵێن: هاوار لەکەسیتر جگە لەتۆ! ئەم پیاوە تۆی بۆ لای چ مەبەستێك رێنوێنی کرد؟ بەرەو ئایینێك کەدایك و باوکت نەیانبیستووە و نەتبینیوە براکەت شوێنی کەوتبێت. ئەبوبەکر بەجامێکی لێوانلێو یەك لەدوای یەك شەرابی بۆ تێکردی و ئەو پیاوە فەرمان پێدراوە بەردەوام جامی خۆشەویستی دەرخوارد دایت و بەرەو لای خۆ بردیت.

کاتێك ئەم قسەیە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، تورە بو و خوێنی ئەوی بەفیڕۆ لەقەڵەمدا. دوای ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی تایف گەڕایەوە، بوجەیر ئەم ڕووداوەی بۆ براکەی خۆی نووسی و وتی: ڕابکە، ڕابکە. بەڵام گومان ناکەم گیان بەدەربەریت. دواتر بۆی نووسی: کاتێك ئەم نامەیەت بەدەست گەیشت باوەڕ بێنە کە ئەو بەم شێوەیە کاری بەڕووداوەکانی پێش ئیسلام نییە. کەعب باوەڕی هێنا و

هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وشترەکەی لەبەر درگای مزگەوت خەواند. لەم کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی بوو. کەعب دەڵێت: ئەوم لەڕووی نیشانییەکانی ناسییەوە. بەسەر دەست وپێی خەڵکا ڕۆشتمە لای و وتم: ئاگاداربە ئەی پێغەمبەر(د.خ)، وەك پەنابەرێك هاتوومەتە لای تۆ. پێغەمبەر(د.خ) وتی: کێیت؟ دواتر ڕوویکردە ئەبوبەکر و پرسی: چی وتبوو؟ ئەبوبەکر ئەو شێعرانەی خوێند کەسەرەتاکەی بەم شێوەیە:

الا ابلغا عنی بجیرا رسالة

کەعب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من بەو شێوەم نەوتووە، بەڵکو وتم:

سقاك ئةبوبةكر بكاس روية      فانهلك المامون منها و علكا

یانی: ئەبوبەکر جامێکی پڕبادەی خۆشەویستی بۆ تۆ تێکرد و ئەو پیاوە پەنادراوە و سەرمەست بووی.

پێغەمبەر(د.خ) وتی: سوێند بەخوا پەنادراویت. لەم کاتەدا ئەنسار هێرشیانکردە سەری و بەتوندی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کرد و قوڕەیشییەکان بەنەرمی و ڕێزیان لەباوەڕەکەی گرت. ئەو شێعرێکی وت کەسەرەتاکەی بەمشێوەیە:

بانت سعاد فقلبی الیوم متبول      متیم اثرها لم یفد مکبول

كاتيَك طةشتة ئةم وتةية:

و قال کل خلیل کنت امله      لا الهینك انی عنه مشغول

نبئت ان رسول الله اوعدنی      والعفو عند رسول الله مامول

فی فتیة من قریش قال قائلهم      ببطن مکة لما اسلموا زولوا

زالوا فما زال انکاس و لا کشف      عند اللقاء و لامیل معازیل

لا یوقع الطعن الا فی نخورهم      و ما لهم عن حیاض الموت تهلیل

پێغەمبەر(د.خ) سەیری قوڕەیشی کرد و فەرمانی پێدان کەبێدەنگ بن و گوێ بگرن. ئەو قسەکەی خۆی بەمشێوە دەست پێکرد:

یمشون مشی الجمال الزهر یعصمهم      ضرب اذا عرد السود التنابیل

واتاکەی: سعادە لەمن جیابوویەوە و لەبەر ئەمە دڵی من ئەمڕۆ نەخۆشی

خۆشەویستییە.

هەر هاوڕێیەك كە هیوام پێی بوو، وتی بێ گومان تۆ سەرقاڵ ناكەم چوونكە من پشت دەكەمە ئەو و ڕوو لەكارێكیتر دەكەم. پێیان ڕاگەیاندم پێغەمبەر(د.خ) منی ئاگادار كردۆتەوە. ئەوەی لەپێغەمبەر(د.خ) دەوەشێتەوە، لێخۆشبوون و بەخشینە. ئەو لەناو ئەو گەنجانەیە كاتێك لەمەككە سەریان بەخوا سپارد، یەكێك لەوان وتی: بلاوەی لێبكەن. ئەوان بلاوەیان لێكرد بەلام نەكەسانی پەست بوون، نە لەكاتی شەڕ بێ قەلغان، نە بەلاڕێدا دەڕۆشتن، نە بێبەش بوون لەكەلوپەلی شەڕ. ئەگەر ڕم ڕوویان تێكات، لەچاڵی ژێر قوڕگیان بچەقێت (لەبەر ئەوەی هەرگیز پشت نەكەنە شەڕ)، ئەوان لەمەلە كردن لەزۆنكاوەكانی مەرگ ترسیان نییە.

درەخشان و بەهێزن و وەك وشترە گەنجە و لاوەكان بەرێدا دەڕۆن. هێزی و لێدانی بازووە بەتواناكان ئەوان دەپارێزێت و ئەمە لەكاتێكدایە ڕەشە كورتە بالاكان رابكەن.

ئەم دێرەی دوایی (هەلاتنی ڕەشە كورتەبالاكان) توانجێك بوو لەئەنسار درا. لەبەر ئەمە قوڕەیشییەكان ئەمەیان پێ ناخۆش و وتیان: ئێمەت وەسف نەكرد كەئەوانت سەركۆنە كرد. بەم قسەی ئەو ڕازی نەبوون و سەركۆنەكردنی ئەو لای ئەنسار گران و دژوار. ئەوان گلەییان لێكرد و ئەو لەوەسفی ئەوان وتی:

| | |
|---|---|
| من سره كرم الحياة فلا يزل | في مقنب من صالحي الانصار |
| الباذلين نفوسهم و دمائهم | يوم الهياج و سطوة الجبار |
| يتطهرون كانة نسك لهم | بدماء من قتلوا من الكفار |

واتاكەی: هەركەس ڕێزداربوونی ژیان شادمانی بكات، دەبێت ڕۆژگارێك لەناو سواركاران لەچاكەكارانی ئەنسار بەسەر بەرێت. ئەوان گیان و خوێنی خۆیان لەڕۆژی شەڕ لەرێگای خوادا دەبەخشن وسەر و جەستەی خۆیان لەخوێنی ناباوەڕان دەشۆن وەك بلێی ئەم ئایینە دینێكە بۆ ئەوان.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی دوورودرێژی هەیە، لەم كاتەدا پێغەمبەر(د.خ) عاباكەی خۆی پێ بەخشی. كاتێك ڕۆژگاری معاویە گەشت، ئەو كەسێكی بۆ لای كەعب نارد و وتی: عاباكەی پێغەمبەر(د.خ) بەئێمە بفرۆشە. كەعب وتی: كەس

لەخۆم بۆ لەبەر کردنی عاباکەی پێغەمبەر(د.خ) بەشیاوتر نازانم. کاتێك کەعب مرد، معاویە ئەوی لەمناڵەکانی کەعبە بە بیست هەزار درەم کڕی و ئەمە ئەو عابایە ئەمڕۆکە لای خەلیفەکانە.

دەستەیەك دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بڕینی زمان و کوشتنی ئەویدا چوونکە ئەو لەسەردەمی جاهلی سەبارەت بەدایکی هانی کچی ئەبوتالیب غەزەلی دەهۆنییەوە.

## شەڕی تەبوك

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەتایف گەڕایەوە، لەنێوان زیحەججە تا ڕەجەب/ ئاوریل/نۆڤەمبەر ٦٣١ زایینی لەمەدینە مایەوە و ئەوسا فەرمانی بەخەڵکدا ساز و بەرگ و باروبنە هەڵگرن و مەبەستی شەڕی ڕۆمیەکان بکەن. خەڵکی لەمەبەستەکەی ئاگادار کردەوە چوونکە ڕێگە دوور و هەوا گەرم و دوژمن بەهێز. پێشتر هەرکات مەبەستی شەڕی دەکرد، لەپۆششی وتارێکدا باسی دەکرد و ناوی شتێکی تری دەهێنا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو بەپێغەمبەریان وت کەهراکلیوس پاشای ڕۆم و مەسیحییە عەرەبەکانی شوێنکەوتووی، مەبەستی شەڕی پێغەمبەریان کردووە. موسوڵمانان ساز وبەرگی شەڕیان هەڵگرت و ڕووبەڕووی ڕۆمیەکان بوونەوە. گەرما سەخت و ساڵ وشك و خەڵك لەدژواریدا بوون. میوەکان گەشتبوون و خەڵك خوازیاری ئەوە بوون بمێننەوە و میوەکان کۆبکەنەوە. لەبەر ئەمە بەناڕەزامەندییەوە خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. ئەو سوپایەیان بەسوپای ڕەنج ناوبرد. پێغەمبەر(د.خ) بەجەد کوڕی قەیس کەیەکێك بوو لەڕێبەری دووڕووەکان، فەرموو: ئایا خوازیاری شەڕ لەگەڵ زەرد ڕووخسارەکان (ڕۆمییەکان، ئەورپاییەکان، فەرەنگییەکان) هەیت؟ وتی: سوێند بەخوا کەسەکانم دەزانن زۆر ژن خۆشەویستم و دەترسم لەبەرابەر پەری روخسارانی زەرد ڕوخسار نەتوانم خۆراگری بکەم و دین و دڵ و جیهان بەوان بسپێرم. ئەگەر فەرمان دەفەرموویت دەخوازم لەشاردا بمێنمەوە، ئاگاداربە، من مەخەرە ئەم تاقیکردنەوە! پێغەمبەر(د.خ) وتی: فەرمانم

بەتۆدا. خوای گەورە ئەم ئایەی نارد: دەستەیەك لەوان دەڵێن: فەرمانێك بدە و مەمخەرە ناو تاقیكردنەوە و پەرێشانییەوە. ئەوان یەكڕاست كەوتونەتە ناو پەرێشانی و شڵەژاوی. بێ گومان دۆزەخ لەهەر لایەكەوە بۆ ناباوەڕانە (توبە/٩/٤٩).

دووبارە یەكێك لە دووڕووەكان وتی: لەم هەوا گەرمەدا مەڕۆن بۆ شەڕ. ئەم قسەی خوای گەورە لەوەڵامی ئەو هاتەخوار: ئەوانەی بەمانەوە شاد بوون كە هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوایان نەكرد و حەزیان نەكرد بەگیان و سامان لەرێگای خوادا شەڕ بكەن. وتیان: لەگەرمای سوتێنەر بۆ شەڕ مەكەن. بڵێ: ئاگری دۆزەخ سوتێنەرترە، ئەگەر توانایی تێگەیشتنیان هەیە (توبە٩/٨١).

دواتر پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕ ئامادە و فەرمانیدا خەڵك سامانی خۆیان لەرێگەی خوادا خەرج بكەن. دەوڵەمەندەكان پیاوانە خەرجیانكرد. ئەبوبەكر هەرچی لەسامانەكەی مابوویەوە، خەرجیكرد. عوسمان پارەیەكی زۆری تەرخانكرد كەپێشتر كەس بەو ئەندازەیەی نەكردبوو. دەڵێن: بەشی ئەو سێسەد وشتر و هەزار دینار بوو.

دواتر چەندین پیاو لەموسوڵمانەكان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و بەگرینۆكەكان ناوبران و ئەوان حەوت كەس لەئەنسار و هاوشێوەكانیان بوون. ئەوان هەژار و دەستكورت بوون و داوایان لەپێغەمبەر(د.خ) كرد چوارپێیان پێدات تا سواری بن و بڕۆنە شەڕ. پێغەمبەر(د.خ) وتی: چوارپێ نابینم بیدەم بەئێوە. ئەوان گریان گەڕانەوە. یامین كوڕی عومەیر كوڕی كەعبی نەزری ئەوانی بینی و پرسی بۆ دەگرین. ئەوان هۆكارەكەیان پێوت. ئەو بەئەبو لەیلی عەبدولرەحمان كوڕی كەعب و عەبدوڵڵە كوڕی موغفەلی موزنی وشترێكیدا كەهاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) سواری دەبوون.

دواتر بیانوگران لەعەرەب هاتن و داوای لێخۆشبوونیان كرد بەڵام خوا پێی رازی نەبوو. دەستەیەك لەموسوڵمانەكان بێ گومان لەلەشكری پێغەمبەر(د.خ) كشابوونەوە و لەوان: كەعب كوڕی مالك و موراره كوڕی رەبیع و هیلال كوڕی ئومەییە و باوكی خەیسمە.

كاتێك پێغەمبەر(د.خ) رەوانە بوو، عەبدوڵڵە كوڕی ئەبی سەركردەی دووڕووەكان

و هاوڕێیـانی بـەدوڕوویی کـشانەوە. پێغەمبـەر(د.خ) سـیباع کـوڕی عورفتـەی وەك جێگـری خـۆی لەمەدینـە و عـەلی کـوڕی ئـەبی تـالیبی وەك جێگـری خـۆی لەسـەر بنەماڵەکەی دیاریکرد. دووڕووەکان زماندرێژیان کرد و وتیان: ئەوی لەشوێنەکەی خۆی دانا چوونکە شەڕەکەی بەقورس بینی و نەیویست ئەوبخاتە دژوارییەوە (یا عەلی خۆی شەڕەکەی بەدژوار بینی). کاتێك ئەم قسەیە بەگوێی عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، کەلوپەلی شەڕی هەڵگرت و پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بوو و وتاری دووڕووەکانی بۆ گێڕایەوە. پێغەمبـەر(د.خ) وتـی: درۆیـان کـرد بۆیـە تـۆم لەجێگـەی خۆم دانا چوونکە پشتم بەتۆ قایمە. بگەڕێرەوە و جێگری مـن بـە لـەناو بنەماڵەکـەم. ئایا ناتـەوێت ئـەو پێگـەیـەت بـۆ مـن هـەبێت کـەهارون بۆ موسـا بووی؟ جگـە لـەوەی دوای من پێغەمبەریك نییە. عەلی گەڕایەوە و پێغەمبەر(د.خ) ڕۆیشت.

باوکی خەیسمە چەند ڕۆژێك مایـەوە. ڕۆژێك گەڕایـەوە بۆ مـاڵ، دوو ژنـی بـوو. هەرکام لەو دوو ژنە سایەوانێك، ئاوی ساردیان بۆ ئامـادە و خواردنیـان بۆ دروست کرد. کاتێك ئەمەی بینی وتـی: پێغەمبـەر(د.خ) بووە ئامانجی گەرمای سوتێنەر و باکـەی و بـاوکی خەیـسمە لـەئاوی سـارد و سـێبەری فێنـك کـەڵك وەربگرێـت و لەماڵەکـەی خـۆی دانیـشێت! ئـەم دادپـەروەری نییـە. سـوێند بـەخوا هیـچیەك لەسایەوانەکان نابینم تا پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) نەبم. توێشوی هـەڵگرت و سـوار چوارپێ ئاوکێشەکەی خۆی بوو و بەدوای پێغەمبـەر(د.خ) گـەڕا و ئەوی لەتـەبوك دۆزییەوە. خەڵك وتیان: ئـەی پێغەمبـەر(د.خ)، سوارەیەك بەغاردان بەرەو لای ئێمـە دێت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی سوارە، باوکی خەیسمە بە!. وتیان: سوێند بـەخوا بـاوکی خەیـسمەیە وئـەو هاتـە لای پێغەمبـەر(د.خ) و ڕووداوەکـەی بـۆ گێڕایـەوە و پێغەمبەر(د.خ) لەخوا داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد.

کاتێـك پێغەمبـەر(د.خ) لەسـەر ڕێگەکـەی لای حجـر یـانی پاشمـاوەی نەتـەوەی سـەمود تێپـەڕی، بـەهاوڕێیانی خـۆی وت: لـەئاوی ئـەم سـەرزەمینە مەخۆنـەوە و دەست نوێژی لێمـەگرن و ئەگـەر ئاردتـان بـەم ئـاوە کردبێتـە هـەویر، فڕی بـدەن یـا دەرخواردی وشترەکانی بدەن و لـەم سـەرزەمینە هیچ مـەخۆن و دەست لەهەویرەکە مەدەن و کەڵکی لێ مەبەن. ئەمشەو هیچ کـەس جگە لەگـەڵ هاوڕێکەی نەڕواتـەدەر.

خەڵك ئەو كارەیان كرد وكەس بەتەنیا نەڕۆشتەدەر جگە لەدوو كەس لەمناڵەكانی ساعدە: یەكیان بۆ ئەنجامی كارێك ڕۆشتەدەر و شێت بوو و یەكیان بەدوای وشترەكەی خۆی گەڕا كەبا بردی بۆ كوێستانی تەی. ئەم دوو هەواڵەیان بەپێغەمبەر(د.خ) گەیاند وئەو وتی: مەگەر پێم نەوتن هەر كەس لەگەڵ هاورێكەی خۆی بڕواتەدەر؟ ئەوەی شێت ببوو، لەخوا پاڕایەوە شیفای بدات و شیفادرا و ئەوەی با بردبووی بۆ كوێستانی تەی، خەڵكانی تەی وەك دیاری پێشكەشی پێغەمبەریان كرد و ئەمە دوای گەڕانەوە لەتەبوك بوو. خەڵك لەحجر بێ ئاو مانەوە و لەبێ ئاوی لای پێغەمبەر(د.خ) گلەییان كرد. ئەو لەخوا پاڕایەوە و خوا پەڵە هەورێكی نارد و بارانی باراند ئەوەندەی خەڵك خورادییانەوە وتێراوبوون.

یەكێك لەدووڕووەكان هاوڕێی پێغەمبەر(د.خ) بوو، ئەو بەرێگادا دەڕۆشت، كاتێك باران باری، یەكێك لەخوا باوەڕان پێی وت: ئایا دوای ئەمەیش گومانت هەیە؟ (هێشتا باوەڕت بەپێغەمبەری ئەو نەهێناوە؟) ئەو پیاوە وتی: زیاتر لەهەورێكی تێپەر نەبوو.

لەرێگا وشترەكەی پێغەمبەر(د.خ) ون بوو. ئەو بەهاوەڵاتی خۆی وت ( و لەناو ئەوان عومارە كوڕی حزم یەكێك لەهاوڕێیانی بەدر و ئامادەبووان لەعەقەبە لەمەككە بوو): پیاوێك لەناو ئێوە وتوویەتی محەممەد هەواڵەكانی ئاسمان دێنێت بەڵام نازانێت وشترەكەی بۆ كوێ رۆشتووە. سوێند بەخوا، جگە لەو شتەی خوا فێری كردووم، هیچ نازانم. وشترەكەم ئێستا لەفلان دۆڵ لەفلان كەلێندایە كەجڵەوەكەی لەدارێك گیری كردووە و لەوێ ماوەتەوە. هاورێكانی ڕۆشتن و وشترەكەیان هێنا. عومارە گەڕایەوە بۆ لای هاورێكانی خۆی و بەسەرسوڕمانەوە داستانی ونبوونی وشترەكە و دۆزینەوەی لەلایەن پێغەمبەرەوە گێڕایەوە. زەید كوڕی لوسەیتی قەینوقاعی لەدووڕووەكان كەلەناو دەستەی عومارە بوو، ئەو قسەی كردبوو كە(محەممەد هەواڵەكانی ئاسمان دێنێت بەڵام نازانێت وشترەكەی بۆ كوێ ڕۆشتووە). بەعومارەیان وت زەید ئەو قسەی كردووە. عومارە هەستا و قاچی خستە سەر ملی و بەردەوام دەیوت: لەناو دەستەكەی من زیانێكی ژەهراوی هەبێت و من نەزانم! لەدەستەكەی من بڕۆدەر ئەی دوژمنی خوا! دەستەیەك گومان دەكەن

زەید دوای ئەوە بۆ لای خوا گەڕایەوە و باوەڕەکەی بەهێز بوو. دەستەیەك دەڵێن: بەردەوام دووڕوو بوو تا مرد.

لەم کاتەدا وشترەکەی ئەبوزەر لەڕۆشتن وەستا و ئەو سوار لەسەری چاوەڕوانی کرد و لەکاروانەکە بەجێما. وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوزەر بەجێما. وتی: وازی لێ بێنن ئەگەر ئەو بەکەڵك بێت، خوا بەئێمەی دەگەیەنێت. هەرکەس دوادەکەوت، پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی دەوت. ئەبوزەر ماوەیەك لەسەر وشترەکەی خۆی چاوەڕێی کرد و کاتێك وشترەکە بەهێواشی دەڕۆشت، کەل و پەلەکانی خۆی خستە سەر پشت و پیادە شوێن پێغەمبەر(د.خ) کەوت. خەڵك سەیری دوواوەیان کرد و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، پیاوێك بەپێ و تاق و تەنیا بەرێگادا دەڕوات. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی پیاو، ئەبوزەر بە! کاتێك خەڵك بەجوانی سەیریان کرد، وتیان: ئەبوزەرە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: خوا لەئەبوزەر خۆش بێت کەبەتەنیایی بەرێگادا دەڕوات، بەتەنیایی (یا لەتەنیاییدا) دەمرێت، بەتەنیا زیندوو دەکرێتەوە و دوای مردنی دەستەیەك لەباوەڕداران بەخاکی دەسپێرن.

کاتێك عوسمان کوڕی عەففان ئەبوزەری لەمەدینە دوورخستەوە و ناردی بۆ ڕەبزە، لەوێ ئەجەل بەرۆکی گرت و جگە لەهاوسەر و کۆیلەکەی کەسی لەگەڵدا نەبوو. ئەوانی ڕاسپارد، بیشۆن و کفنی کەن و لەسەر ڕێگا داینێن. یەکەم کاروان کەگەشت، ئەم دووانە بۆ دفن کردنی ئەو داوای هاوکاریان لێکردن. لەم کاتەدا عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك عێراقی گەیشت و ژنەکەی ئەبوزەر ئەوانی لەمەرگی هاوسەرەکەی ئاگادار کردەوە. عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود گریا و وتی: پێغەمبەر(د.خ) ڕاستی وت: ئەی ئەبوزەر بەتەنیایی بەرێدا دەڕۆیت ولەتەنیاییدا دەمریت و بەتەنیایی لەم جیهانە کۆچ دەکەیت. دواتر ئەوی بەخاك سپارد.

سەرئەنجام پێغەمبەر(د.خ) گەشتە تەبوك ولەم کاتەدا یوحەنا کوڕی ڕوبە فەرمانداری (ئەیلە) گەیشت ولەسەر دانی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و پێغەمبەر(د.خ) لەمبارەوە نامەی بۆ نووسی. باجی ئەوان بەسێسەد دینار مەزندە کرا. دواتر خەلیفەکانی مناڵەکانی ئومەییە ئەم باجەیان زیاد کرد. کاتێك عومەر

کوڕی عەبدولعەزیز هاتەسەر کار، جگە لەو سێسەد دینارە داوای هیچی زیادەی لێ نەکردن. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ خەڵکانی (ئەزرۆح) لەسەر دانی سەد دینار باج پەیمانی ئاشتی بەست کەهەر ساڵ لەمانگی رەجەب ئەو پارەیە بدەن. لەگەڵ خەڵکی جەربا لەسەر دانی باج پەیمانی ئاشتی بەست و لەگەڵ خەڵکی شاری مەقەنا لەسەر چوار یەکی میوەکانیان.

لەم زەمانەدا پێغەمبەر(د.خ) خالید کوڕی وەلیدی بۆ شەڕی ئوکەیدەر کوڕی عەبدولمەلیك فەرمانڕەوایی دومەئەلجەندەل کەپیاوێکی مەسیحی لەهۆزی کەندە بوو، رەوانە کرد. پێغەمبەر(د.خ) بەخالیدی وت: لەکاتێکدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە کەڕاوی گا دەکات. خالید ڕۆشت تا ئەوەی قەلأی ئوکەیدەر کەوتە بەرچاوی. ئوکەیدەر لەسەر بانیماڵەکەی خۆ بوو. لەم کاتەدا گا دەشتی و کێوییەکان نزیکبوونەوە و بەشاخەکانی خۆیان لەدیوارەکانی قەلأیان دەدا. هاوسەرەکەی وتی: ئایا پێش لەمە شتێکی وات بینیبوو؟ ئوکەیدەر وتی: سوێند بەخوا نەمدیبوو. ئوکەیدەر هاتە خوار و سوار ئەسپەکەی خۆی بوو وچەند کەسێك لەبنەماڵەکەی هاوڕێیەتیان دەکرد. دواتر شوێن گاکان کەوت کەلەناکاو سوارەکانی سوپای پێغەمبەر(د.خ) ڕووبەڕووی بوونەوە و ئەویان گرت و براکەی حسانیان کوشت. خالید لەئوکەیدەر کوڕی عەبدولمەلیك ڕووپۆشێکی حەریری بەزێرچنراوی وەرگرت و ناردی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). موسوڵمانان دەستیان لێدەدا و سەریان سوردەما. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئایا لەم ڕووپۆشە سەرتان سوردەمێنێت؟ سوێند دەخۆم دەستارەکانی سەعد کوڕی مەعاز لەبەهەشت لەمە زۆر باشترە. خالید ئوکەیدەری هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ) کەلەخوێنی خۆش بوو و لەسەر دانی باج پەیمانی لەگەڵ بەست و ئەوی ئازاد کرد.

پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماوەی دە شەو و کەمێك لەتەبوك مایەوە و زیاتر نەڕۆشتە پێش. نەرۆمیەکان دەهاتنە شەڕی، نەعەرەبە مەسیحیووەکان. ئەو بۆ مەدینە گەڕایەوە. لەسەر ڕێگاکەی ئاوێك بوو کەلەکەلێنی بەردێکەوە دەهاتەدەر و جگە لەیەك یا دوو سواری زیاتر تێرئاو نەدەکرد. ئەم ئاوە لەدۆڵێکدا بوو پێیان دەوت دۆڵی قەڵشاو. پێغەمبەر(د.خ) وتی: هەر کەس پێش ئێمە گەشتە ئەو ئاوە، لێی

نەخواتەوە تا ئێمە دەگەین. دەستەیەك لەدووڕووەکان بۆ ئەوێ رایان کرد و هەموو ئاوەکانی ئەو شوێنەیان خواردەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەشتە ئەوێ، لەکاری ئەو دەستەیە ئاگاداری کردنەوە. ئەوانی نفرین کرد و لەخوا پاڕایەوە، ئەوسا پێغەمبەر(د.خ) دابەزی و دەستەکانی خۆی خستە ژێر ئاوەکە. کەمێك ئاوی هەڵدەگرت و دەیپرژاند. مشتێك ئاوی هەڵگرت و لەخوا پاڕایەوە و پرژاندی بەبەردەکەدا. بەردەکە قەڵشا و ئاو هاتەدەر. خەڵك خواردیان و دەفرەکانی خۆیان پرکرد و چوارپێەکانی خۆیشیان ئاودا. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت تاگەشتە نزیك مەدینە و لێرەدا بوو هەواڵی (مەزگەوتی زیانباریان) پێدا. ئەو مالك کوڕی دوحشومی ڕەوانە کرد وئەو مزگەوتەی ئاگر تێبەدرا و وێرانی کرد و خوا ئەم ئایانەی ناردەخوار: ئەوانەی مزگەوتێکیان بۆ زیان گەیاندن و تۆوی ناباوەڕی پرژاندن و جیایی دروست کردن لەناو خواباوەڕان دروست کرد تا بۆ دوژمنان و شەڕکەران پێشوی خواوەند سەنگەرێکی بەهێز بێت (لەبیریان مەکە). بێ گومان سوێندی زۆریان خوارد کەجگە لەباشە مەبەستێکی تەرمان نەبوو و خوا دەزانێت ئەوان درۆزنەکان. هیچ کات لەو مزگەوتە مەمێنەرەوە. مزگەوتێك لەیەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنەمای خۆپارێزی دروست کرابێت، شیاوترە تیایدا بمێنیتەوە. لەوێ پیاوانێك بەسەردەبەن دەیانەوێت گیان و جەستە خاوێن و خوا خاوێنەکانی خۆش دەوێت. ئایا ئەوەی بیناکەی خۆی لەسەر بنەمای خۆپارێزی لەخواوەند و ڕەزامەندی ئەو بنیات ناوە، باشترە یا ئەوەی بیناکەی خۆی لەسەر لێواری هەڵدێرێکی قوڵ و خاڵی بنیات ناوە. بیناکەی ئەو لەو بەرزاییەوە یەکراست دەڕواتە قوڵایی ئاگری دۆزەخ. وخوا خەڵکانی ستەمکاری خۆش ناوێت. بەردەوام ئەو بینایانەی دروستیان کرد، هۆکاری دڵ پەرێشانی و ڕەشبینی ئەوانە تا ئەوەی دڵیان بتەقێت و لەت لەت بێت و خوا زانای فرەزانە (تۆبە/١٠٧—١١٠).

ئەو کەسانەی ئەم مزگەوتەیان دروست کرد، دوانزە کەس بوون و زەوییەکەیان لەماڵی خزام کوڕی خالید لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف جیا کردبوویەوە. دەستەیەك لەدووڕووەکان لەهاوڕێیەتی ئەو پاشەکشەیان کرد و لەم کاتەدا ڕۆشتنە لای و داوای لێخۆشبوونیان کرد. پێغەمبەر(د.خ) لەوان خۆشبوو بەڵام خواوەند و

پێغەمبەرەکەی لەوان خۆش نەبوون. سێ کەس لەباوەڕداران دەستیان لەهاوکاری کردنی هەڵگرت کەئەمانە بوون:کەعب کوڕی مالك و هیلال کوڕی ئومەییە و موراره کوڕی رەبیع. پاشەکشێی ئەوان نە لەڕووی ڕەشبینییەوە بوو نەلەدووڕوویی. پێغەمبەر(د.خ) بەخەڵکی فەرموو لەقسە کردن لەگەڵ ئەوان خۆبپارێزن. خەڵك لەوان خۆیان دوورخستەوە وئەوان بۆ ماوەی پەنجا شەو بەوشێوەیە مانەوە. ئەوسا خوا ئەوانی بەخشی وئەم ئایەی ناردەخوار: هەروەها خوا سیانی لەوان بەخشی کە لەلەشکرەکەی پێغەمبەر(د.خ) پاشەکشەیان کرد تا ئەوەی زەوی بەهەموو بەربلاوییەکەی تەنگ بوو و زەختی لەگیانی ئەوان کرد و زانیان جگە لەخوا ناتوانن پەنا بۆ کەس ببەن. ئەوسا خوا لەوان خۆشبوو تا بۆ لای خوا بگەڕێنەوە کە بێ گومان خوا باشترین بەخشەری میهرەبانە (تویە/٩/١١٨). هاتنەوەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە لەتەبوك، لەمانگی رەمەزان /دیسامبەری ٦٣١ زایینی بوو.

## هاتنی عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی بۆ لای پێغەمبەر( د.خ )

لەم ساڵەدا عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبووە، بەڵکو لەکاتی گەڕانەوەی لەتایف داوای فەرمانێکی لەپێغەمبەر(د.خ) کرد تا ئیسلام بۆ ناو خەڵکەکەی بکات. پێغەمبەر(د.خ) وتی: بێ گومان تۆ دەکوژن. عوروە وتی: من لەیەکەم منداڵەکان لای ئەوان خۆشەویستترم. ئەو هیوادار بوو لەسەر بنەمای ئەو پێگەی لای ئەوان هەیەتی، لەگەڵی هاوڕابن. کاتێك بۆ تایف گەڕایەوە، ڕۆشتە سەر هەیوانی باڵەخانەکەی خۆی و ئیسلامی خۆی ئاشکرا کرد و داوای کرد ئەوانیش باوەڕ بێنن. ئەویان بەتیرە گیان کونکەرەکان تیربارانیانکرد. پێیان وت: سەبارەت بەخوێنی خۆت چۆن بیردەکەیتەوە؟ وتی: خوا بەوە منی بەرێز کرد و بەگیان بەخشین گەورەی کردم و هەموو ڕێزدارەیەکی پێ بەخشیم. لەگیان و پەیکەری من ئەوەیە کە لەگیان وپەیکەری کوژراوەکان لای پێغەمبەر(د.خ). من لەگەڵ ئەوان بەخاك بسپێرن. کاتێك مرد، ئەویان لەگەڵ ئەواندا بەخاك سپارد. پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەو وتی: وەك ئەو لەناو خەڵکەکەی وەك خواوەندی یاسین لەناو خەڵکەکەیەتی.

## گەشتنی دەستەی نوێنەرایەتی سەقیف

لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان/ دێسامبەری ٦٣٠ زایینی دەستەی نوێنەرایەتی سەقیفییەکان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

هۆکاری ئەم کارەیان ئەوە بوو سەقیفییەکان بینیان عەرەبەکانی دەوروبەری ئەوان بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کردووە و دەیانەوێت هێرشیان بکەنەسەر. سەختگیرترین کەس لەناو ئەوان مالك کوڕی عەوف ئەنساری بوو. هیچ سامانێك لای سەقیفییەکان نەدەڕۆشتەدەر مەگەر ئەوەی تالآن دەکرا و هیچ کەس نەدەهاتەدەر مەگەر ئەوەی دەکوژرا. کاتێك بینیان ناتەوانن، کۆبوونەوە و ئەمانەیان ناردە لای پێغەمبەر(د.خ): عەبد یالەیل کوڕی عەمرۆ کوڕی عومەیر، حەکەم کوڕی عەمرۆ کوڕی وەهب، شۆرەحبیل کوڕی غەیلان. ئەم سیانە لەناو هاوپەیمانەکان بوون. لەمناڵەکانی مالك ئەمانەیان نارد: عوسمان کوڕی ئەبی عاس، ئەوس کوڕی عەوف و نومەیر کوڕی خەرەشە. ئەوان بەرێکەوتن تا گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر ئەوانی لەژێر بارەگای مزگەوت بینی. خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس لەنێوان ئەواندا هاتوچۆی دەکرد. پێغەمبەر(د.خ) خواردنی بۆ ناردن تا لەگەڵ خالید بیخۆن. هیچ خواردنێکیان نەدەخوارد تا خالید لێی بخوات. بەم شێوەبوو تا باوەڕیان هێنا.

لەو شتانەی لەپێغەمبەریان داوا کرد، ئەوە بوو کە (کەرەستەی بێدادگەری) (لات) بۆ ماوەی سێ ساڵ وەك خۆی بهێڵێتەوە و لەناو نەبات. پێغەمبەر(د.خ) رازی نەبوو. مەبەستیان لەم کارە ئەوە بوو بەهێشتنەوەی لەزیانی نەزانەکان و ژنەکانی خۆیان پارێزراو بوون. یەك مانگیان بەم شێوەیە بەسەر برد و پێغەمبەر(د.خ) رازی نەبوو. داوایان لێکرد لەنوێژکردن بیانبەخشێت، وتی: ئایینێك کەنوێژی نییە، هیچ سودێکی نییە. ئەوان رازی بوون و جەستە وگیانیان بەخوا سپارد. پێغەمبەر(د.خ) عوسمان کوڕی ئەبی عاسی کردە فەرمانڕەوایی ئەوان و ئەوگەورەترینیان بوو چوونکە زیاد لەرادە باوەڕەکەی بەهێز و هەوڵیدەدا فێرکارییە دینییەکان فێر ببێت. ئەوان بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان گەڕانەوە و پێغەمبەر(د.خ) موغیرە کوڕی شوعبە و

ئەبوسوفیان کوڕی حەربی لەگەڵ ڕەوانە کردن تا کەرەستەی بێدادگەری لەناو ببەن و بیشکێنن. موغیرە هەنگاوی بردە پێش و وێرانی کرد. خەڵکەکەی لەمناڵەکانی شوعەیب چواردەوریان گرت نەکا بەتیر بیکوژن. ژنانی سەقیف بەدەم گریان و بەسەری ڕووت بۆ ئەوێ رایان کرد و شینیان کرد و بۆ بتەکە ئایینی پرسەیان دانا. موغەیرە زێڕ و زیو و سامانی بتەکەی هەڵگرت.

باوکی مەلیح کوڕی عوروە کوڕی مەسعود و قارب کوڕی ئەسوەد کوڕی مەسعود، دوای کوژرانی عوروە و ئەسوەد ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) بەم دووانەی فەرموو قەرزەکانی عوروە وئەسوەد کوڕی مەسعود بدەنەوە. ئەو دووانە، قەرزەکانیان دایەوە. ئەسوەد ناباوەڕ مردبوو ولەبەر ئەمە کوڕەکەی قارب داوای لەپێغەمبەر(د.خ) کرد قەرزەکەی بداتەوە. وتی: ئەو ناباوەڕ بوو. وتی: هەر باوەڕدارێك پەیوەندییە خزمایەتی خۆی بەهێز رادەگرێت. یانی ئەوەی ئەو باوەڕی هێناوە و پەیوەندی کوڕبوونی خۆی لەگەڵ باوکی بەهێز رادەگرێت هەرچەند بتپەرەست بێت.

## شەڕی تەی و باوەڕ هێنانی عودەی کوڕی حاتەم

لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع ئەلئەوەل /ژوئەنی ٦٢٠ زایینی پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بۆ شەڕی هۆزی تەی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا بتەکەی ئەوان (فلس) تێکبشکێنێت. ئەو ڕۆشت و هێرشیکردە سەر ئەوان و ئەسیری لێگرتن و بتەکەی تێکشکاند. بتەکە دوو شمشێری پێوە بوو کەبەیەکیان دەوت (مخذم) و بەویتریان دەوت (رسوب). عەلی هەردوو شمشێرەکەی هەڵگرت و هێنای بۆ پێغەمبەر(د.خ). هەردوو شمشێرەکە حارس کوڕی ئەبی شمر پێشکەشی بەو بتەی کردبوو و بەبتەکەوە هەڵیان واسیبوو. کچەکەی حاتەمیشی بەئەسیری گرت و بردییە مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو ئازادی کرد.

داستانی باوەڕ هێنانی عودەی کوڕی حاتەم لەزمانی خۆیەوە بەمشێوەیە: سوارەکانی پێغەمبەر(د.خ) هاتن و خوشکەکەی منیان لەگەڵ دەستەیەکیتر گرت و بردیانە لای پێغەمبەر(د.خ). خوشکەکەم وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، باوکم مرد و

پاسەوانەکەمان خۆی داشارد. لەمن خۆشبە تا خوا لەتۆ خۆش بێت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: پاسەوانەکەی تۆ کێیە؟ کچ وتی: عودەی کوڕی حاتەم. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوەی لەخوا و پێغەمبەرەکەی رایکرد! پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەخشی و لای ئەو پیاوێك وەستابوو کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. پێغەمبەر(د.خ) چەند بەرخێکی پێدا، جل وبەرگی لەبەر کرد و خەرجی پێدا. عودەی دەڵێت: لەم کاتەدا پاشای هۆزی تەی بووم و چوار یەکم لێ وەردەرگرتن و لەسەر ئایینی مەسیحی بووم. کاتێك سوارەکانی پێغەمبەر(د.خ) گەیشتن، لەدەست ئیسلام بۆ شام رامکرد وبەخۆم وت: لای هاودینەکانی خۆم بەسەر دەبەم. لەوکاتەی لەشام بووم، خوشکەکەم هاتە لام و سەرکۆنەی کردم کە بۆ بەتەنیا جێم هێشتووە و هاورێ لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆی بەبێ ئەو رایکردووە. دواتر وتی: بۆچوونی من وایە، هەرچی زوتر خۆت بگەیێنیتە لای محەممەد چوونکە ئەگەر پێغەمبەر بێت، بەخێرایی باوەڕی پێدێنێت، لەپێشی دەبێت و ئەگەر پاشا بێت، بەهەمان شێوە لای ئەو بەرێزەوە درێژە بەژیان ئەدەیت. دەڵێت: هاتمە لای پێغەمبەر(د.خ) و سڵاوم بۆ نارد و خۆم ناساند. ئەو منی هەڵگرت و بردمی بۆ ماڵەکەی. لەرێگا ژنێکی ناتەوان رێگەی لێ گرت و ئەوی بۆ ماوەیەکی درێژ وەستاند و سەبارەت بەخۆی قسەی لەگەڵ کرد و وتارەکەی خایاندی. بەخۆم وت: ئەمە پاشا نییە، دواتر رۆشتمە ماڵەکەی، منی لەسەر دۆشەك دانیشاند وخۆی لەسەر زەوی دانیشت. بەخۆم وت: ئەمە پاشا نییە. دواتر پێغەمبەر(د.خ) بەمنی وت: ئەی عودەی، تۆ چواریەك وەردەگریت کە لەئایینەکەی تۆ رەوانییە. گومان دەکەم لەبەر ئەوە باوەڕ بەئیسلام ناهێنیت چوونکە دەبینیت ئێمە نیازمەند و دوژمنەکانمان فراوان. سوێند بەخوا سامانێکی فراوان لەهەر لایەك بەسەر موسوڵماناندا دەبارێت، و کەس نابێت کۆی بکاتەوە. سوێند بەخوا بێ گومان نازناوی ژنێك دەبیستیت کە سوار لەسەر وشترەکەی خۆی لەقادسییەوە رەوانەی ماڵی خوا دەبێت وجگە لەخوا لەکەس ناترسێت. سوێند بەخوا بێ گومان دەبیستی کە هاورێیانی من کۆشکە سپیەکانی بابلیان داگیر کردووە. عودەی دەڵێت: من باوەڕم هێنا وئەوەندە ژیام تابینیم کۆشکە سپیەکانی بابل داگیر کران. بینیم ژن

لەماڵەکەی دێتەدەر و جگە لەخوا لەکەس ناترسێت و سوێند بەخوا بێ گومان سێیەمین پێشگوییی پێغەمبەریش دێتەدی وئەوەندە سامانی زۆر لەم لاولاوە دەبارێت کەس دەست ناکەوێت کۆیان بکاتەوە.

## گەشتنی دەستە وێنەرایەتیەکان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەککەی گرت و سەقیفییەکان باوەڕیان هێنا وئەو لەتەبوك گەڕایەوە، دەستەی نوێنەرانی عەرەب لەهەر لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد. عەرەبەکان بۆ باوەڕهێنان چاوەڕوانی قوڕەیشییەکان بوون چوونکە ئەوان پێشەنگی خەڵکان و مناڵە تایبەتییەکانی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم و پاسەوانانی بارەگایی خوایی بوون و عەرەبەکان باوەڕیان بەهەموو ئەم پێگانە هەبوو. هەر ئەم قوڕەیشیانە بوون ئالای شەڕیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) هەڵکردبوو. کاتێك مەککە دەستی بەسەرداگیرا و قوڕەیشییەکان باوەڕیان هێنا، عەرەبەکان زانیان توانای دوژمنی کردن لەگەڵ پێغەمبەریان نییە. لەبەر ئەمە دەستە دەستە ڕوویانکردە ئەم ئایینە تازەیە بەشێوەیەك خوای گەورە فەرموویەتی: کاتێك هاوکاری خوا بگات وسەرکەوتن بەدەست بێت، دەبینی خەڵك دەستە دەستە ڕوودەکەنە ئەم ئایینە، وەسفی خواوەند بکە وداوای لێخۆشبوونی لێبکە چوونکە بەخشەرێکی گەورەیە (نصر١١٠/١-٣)

دەستەی نوێنەرایەتی عەرەبەکان لەم ساڵەدا یەك لەدوای یەك دەگەیشتن. دەستەی نوێنەرانی مناڵەکانی ئەسەد گەشتنەلای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: پێش ئەوەی وەك پێغەمبەر(د.خ) بێیتە لای ئێمە، ئێمە هاتین بۆ لای تۆ. خوای گەورە ئەم ئایەی ناردە خوار: منەتت دەکەنە سەر کەباوەڕیان هێناوە. بڵێ: بۆ باوەڕهێنانی خۆتان منەت مەکەنە سەر من بەڵکو خوا منەت دەکاتە سەر ئێوە کەبەرەو باوەڕ هێنان ڕێنوێنی کردن ئەگەر ڕاستگۆیانن (حجرات/٤٩/١٧)

لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع ئەلئەوەل / ژوئەن ٦٣٠ زایینی دەستەی نوێنەرایەتی هۆزی (بەلی) هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی زاریان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) وئەوان دەکەس بوون. هەروەها لەم ساڵەدا

دەستەی نوێنەرایەتی منالەکانی تەمیم لەگەڵ حاجب کوڕی زورارە کوڕی عودەس هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەم کەسانە لەناویاندا بوون: ئەقرەع کوڕی حابس و زەبرقان کوڕی بەدر و عەمرۆ کوڕی ئەهتەم و قەیس کوڕی عاسم و خەتات و مەعمیر کوڕی زەید. ئەوان لەناو دەستەیەکی نوێنەرایەتی گەورەدا بوون و عۆیەیینە کوڕی حسنی فەزاری لەناویاندا دەبینرا. کاتێك ڕۆشتنە ناو مزگەوت، لەپشت ماڵەکانی پێغەمبەرەوە، بانگیان کرد و وتیان: ئەی محەممەد وەرە لای ئێمە. ئەم کارە پێغەمبەری ناراحەت کرد. ڕۆشتە لایان. وتیان هاتووین شانازی بەسەر تۆوە بکەین، ڕێگە بەقسەکەر و وتاردەری ئێمە بدە وتارەکەی دەست پێبکات. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدان. عوتارید هەستا و وتی: سوپاس بۆ خوا کەبەخشینەکانی بەئێمە بەخشیوە. ئەو ئێمەی کردە پاشا و سامانی فراوانی پێداین تا بۆ کارەباشەکان خەرجی بکەین. ئەو ئێمەی کردە بەرێزترین و ڕێزدارترینی خەڵکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست. هەرکەس بیەوێت شانازی بەسەر ئێمەوە بکات، دەبێت هاوشێوەی ئێمە بێت.

پێغەمبەر(د.خ) بەسابت کوڕی قەیسی وت: وەلامی ئەم پیاوە بدەرەوە. سابت هەستا و وتی:

سوپاس بۆ خوا کەزەوی و ئاسمانی بلند و ئافرێنراوە بەرێزەکان هی ئەون. فەرمانی خۆی لەناو ئەواندا بلاو کردەوە و تەختی زانستی هەموو شوێنێکی گرتەوە. هەرگیز هیچ دیاردەیەك جگە لەبەخشینەکانی ئەو نابێتە ڕاستی. لەبەهێزی ئەودابوو، ئێمەی کردە پاشا و لەناو باشترین بەندەکانی پێغەمبەرێکی بۆ ئێمە نارد کەنەژادی لەهەموو خەڵکانیتر بەرێزتر و قسەکەی لەهەمووان ڕاستتر و بنەماڵەکەی لەهەمووان ڕێزدارترە. ئەو پێغەمبەرەکەی کردە ئەمینی ئافرێنراوەکانی کەهەڵبژێردراوترینی هەڵبژێردراوان لەناو خەڵکانی سەر زەوییە. پێغەمبەر(د.خ) خەڵکی بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا بانگ کرد و موهاجیرەکان لەخەڵکەکەی خۆی و لەبنەماڵەکەی باوەڕیان پێی هێنا و ئەمانە لەنەژاد لەهەموو خەڵکانیتر بەرێزترن و لەهەموو خەڵکان چاکتر و چاکەکارتر. یەکەم کەسان ئێمە بووین وەلامی بانگەوازەکەی ئەومان دایەوە. ئێستا ئێمە هاوڕێیانی خوا و وەزیرەکانی

پێغەمبەرەکەی ئەوین. شەڕ لەگەڵ خەڵك دەکەین تا باوەڕ بێنن. هەرکەس باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی بێنێت، خوێن و سامانەکەی پارێزراو دەبێت و هەرکەس لەسەر ناباوەڕی بمێنێتەوە، بۆ هەمیشە لەرێگای خوادا شەڕی لەگەڵ دەکەین و کوشتنی ئەو بۆ ئێمە ئاسانە. سڵاو لەئێوە.

لەم کاتەدا وتیان:ئەی پێغەمبەر(د.خ)، فەرمان بەوتاردەرەکەی ئێمە بدە وتارەکەی پێشکەش بکات. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا و زەبرقان هەستا و وتی:

نحن الكرام فلا حي يعادلنا — منا الملوك و فينا تنصب البيع
وكم قسرنا من الاحياء كلهم — عند النهاب و فضل العرب يتبع
و نحن يطعم عند القحط مطعمنا — من الشواء اذا لم يونس القزع
بماترى الناس ياتينا سراتهم — من كل ارض هويا ثم نصطنع
فننحر الكوم عيطا في ارومتنا — للنازلين اذا ما انزلوا شبعوا
فلا ترانا الى حي نفاخرهم — الا استقادوا و كاد الراس يقتطع
انا ابينا و لن يابى لنا احد — اذا كضلك عند الفخر نرتفع
فمن يفاخرنا في ذاك يعرفنا — فيرجع القول و الاخبار تستمع

واتاکەی: ئێمە بەرێزەکانین و هیچ دەستەیەك ناتوانێت بەرابەریمان بکات. پاشاکان لەناو ئێمەن و پەرەسگا بڵندەکان لەشارەکانی ئێمە دروست کراون. چەند زۆرن ئەو خەڵکانەی هەموویانمان سەرکوت کرد ولەکاتی تاڵانکردن لەناومان بردن. ئێمەین کاتێك وشکەساڵی دەبێت و هەورە باران زاکان ئاو بەکەس نادەن، رۆژیدەری ئێمە خواردن بەخەڵك دەدات و گۆشتی برژاویان بۆ دەخاتە سەر سفرە. ئەمە لەبەر ئەوەیە گەورەکانی ئێمە بەخێرایی دێنە لامان و رێزیان لێدەگیرێت و پەروەردە دەکرێن و باڵ وپەڕ دەکەنەوە. وەشتر گەورە قەڵەوەکان بۆ میوانەکانمان سەردەبڕین، هەرکەس بێتە لای ئێمە، تێر و شادمان دەگەڕێتەوە. هەرگیز نابینیت شانازی بەسەر خەڵکێکەوە بکەین جگە لەوەی گرفتاریان بکەین و هێرشیان بکەینە سەر و ئەگەری هەیە سەرەکان لەجەستە جیابکەینەوە. ئێمە لەرازی بوون بەستەمگەری خۆمان بەدوور دەگرین بەڵام هیچ کەس لەبەرابەر ئێمە گەردنکێشی ناکات، ئێمە لەکاتی شانازی کردن بەمشێوەین و بڵندپایە. هەرکەس لەم گۆڕپانەدا

شـانازی بەئێمـەوە بکـات، بەباشـی دەمانناسـێت. وتـەکان دەگەڕێنـەوە شـوێنی سەرەکی خۆیان و هەواڵەکان بەگوێی هەمووان دەگات.

لـەم کاتـەدا حـسان کـوڕی سـاتب ئامـادە نـەبوو. پێغەمبـەر(د.خ) بـانگی کـرد تـا وەڵامی ئـەم پیـاوە بداتـەوە. حـسان دەڵێـت: کاتێـك وتارەکـەی ئـەوم بیـست لەسـەر هەمان شێوە و ئاواز وەڵامم دایەوە:

| | |
|---|---|
| ان الذوائب من فهر و اخوتهم | قد بينوا سنة للناس تتبع |
| قوم اذا حاربوا ضروا عدوهم | اوحاولوا النفع فی اشياعهم نفعوا |
| يرضی بها و كل من كانت سريرته | تقوی الاله و كل البر يصطنع |
| سجية بلك منهم غير محدثه | ان الخلائق فاعلم شرها البدع |
| انكان فی الناس سباقون بعدهم | فكل سبق لادنی سبقهم تبع |
| لا يرقع الناس ما اوهت اكفهم | عند الدفاع و لايوهون ما رقعوا |
| ان سابقوا الناس يوما فازسبقتهم | او وازنوا اهل مجد بالندی متعوا |
| لعفةٌ ذكرت فی الوحی عفتهم | لايطبعون و لايزری بهم طمع |
| لا يبخلون علی جاء بفضلهم | ولا يمسهم من مطمع طبع |
| اذا نصبنا لحی لم ندب لهم | كما يدب الی الوحشية الذرع |
| كانهم فی الوغی و الموت مكتنع | اسد بحلية فی ارساغها فدع |
| اكرم بقوم رسول الله شيعتهم | اذا تفرقت الاهواء و الشيع |
| فانهم افضل الاحياء كلهم | ان جد بالناس جد القول اوشبعوا |

واتاکـەی: گـەورەکان و سـەروەرانی (فـەهر) و براکانیـان بناغـەی ئایینێکیـان بـۆ خـەڵك دارشـت تاهـەمووان شـوێنی بکـەون. ئەمانـە کەسـانێکن کاتێـك شـەڕ بکـەن، دوژمنـانی خۆیـان ئـازار دەدەن و سـەرکوت دەکـەن و کاتێـك بـۆ سـود گەیانـدن تێدەکۆشن، سودێکی زۆر بەلایەنگرانی خۆیان دەگەیێنن. لـەم ئایینـە، هـەموو ئـەو کەسانە ڕازین کەکرداری ناخیان خۆپارێزی لەبەرابەر خوایە، هەموو چاکییەکان لەم ئایینـەدا باسـیان لێـوە کـراوە. ئەمـە، چـاکییەکی کـۆن لـەناخی ئەواندایـە و تـازە دروست نەبووە. لەناو عادتەکان (ئەمە بزانە) ئەوانە خراپترینن کەتازە و دەسکرد بـن. ئەگـەر لـەناو خـەڵك کەسـانێك بەپەلـە و پێـشڕەو بـن، هـەرجۆرە پێـشڕەوییەك

لەبەرابەر کەمترین پێشڕەوی ئەوان، جگە لەدوواکەوتن نییە. ئەوەی دەستەکانی ئەوان لەکاتی بەرگری کردن دەیدڕن،خەڵك ناتوان بیدوورنەوە و ئەوەی ئەوان بیدوورن و بەهێزی بکەن، خەڵك ناتوانن بیدڕن. ئەگەر لەگەڵ خەڵك بەئەسپ بەغاردان بڕۆنە پێش، سوارەی ئەوان پێشدەکەوێت و ئەگەر لەگەڵ خواوەندەکانی بەخشش هاوسەنگ بن، لەبەخشین بەسەر ئەواندا زاڵ دەبن. داوێنپاکەکانن کەداوێن پاکی لەقورئانی پیرۆز (بقره٢/٢٧٣) ئاماژەی پێدراوە. سرشتی پیسیان نییە و تەماحکاری ئەوان ناباتە هەڵدێری ڕیسوایی. بەخشینەکانی خۆیان لەدراوسێ ناشارنەوە و لەهەر ڕێبوارێکی تەماحکار، زیان بەوان ناگات. ئەگەر دوژمنایەتی لەگەڵ خەڵك بکەین، دوژمنایەتی خۆمان ئاشکرا دەکەین، نەك ئەو کارەی گوێرەکەی دەشت و بیابان دەیکات کە بەنهێنی و شاراوە دەخزێتە ژێر گوانی دایکی. ئەوان لەڕۆژی شەڕ کەمەرگ لەهەر لایەکەوە دەبارێت، شێرەکانی دارستانن کەزنجیر لەدەست وپێی خۆیان دەکەنەوە. خەڵکانێکی بەرێزن ئەوانەی پێغەمبەر(د.خ) هاوەڵ و گەورەیان بێت. کاتێك مەبەستەکان بڵاوەیان پێبکرێت، یەك مەبەست دەمێنێتەوە کەخۆشەویستی و باوەڕ بە پێغەمبەری بەرێزە. ئەمانە لەپێشترینی هەموو خەڵکانن چوونکە وتاری خەڵك ڕوون و ئاشکرایە یا لەگاڵتە دەچێت و خاو.

کاتێك حسان لەم وتارە تەواو بوو، ئەقرەع کوڕی حابس وتی: ئەم پیاوە بەهرەیەکی خوایی هەیە. وتاردەرەکەی ئەو بەتواناترە لەوتاردەرەکەی ئێمە و قسەکەرەکەی خۆش قسەتر لەقسەکەری ئێمە. دواتر باوەڕیان هێنا و پێغەمبەر(د.خ) بەخشینەکانی خۆی پێبەخشین هاوڕێ لەگەڵ سامانێکی زۆر. سەبارەت بەوان بوو خوای گەورە ئەم ئایەی نارده خوار: ئەوانەی لەپشت دیواری ماڵەکانەوە بانگ تۆ دەکەن، زۆربەیان نەزانەکانن. ئەگەر چاوەڕوان بن تۆ بڕۆیتە لایان، بۆ ئەوان باشترە و خوا بەخشەر و میهرەبانە (حجرات /٤٩/٤-٥).

## ڕووداوەکانیتر

لەم ساڵەدا نامەی پاشاکانی حومەیر بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت و هەموویان باوەڕیان بەئیسلام هێنا. هاورێ لەگەڵ ئەوان پەیکەکەیان حارس کوڕی عەبد کولال و نەعمان سەروەری زی روعەین و هەمدان بوون. زورعە زویزەن، مالك کوڕی مورەی ڕەهاوی ڕەوانە کرد وباوەڕهێنانی ئەوانی بەپێغەمبەر(د.خ) ڕاگەیاند. پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ ئەوان نووسی و ئاگاداری کردنەوە هاوشێوەی باوەڕداران دەبێت چ کارێك ئەنجام بدەن و لەچ کارێکی ناڕەوا دەبێت خۆیان دووربخەنەوە. لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی بەهرا گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و لەماڵی مقداد کوڕی عەمرۆ مانەوە. هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی مناڵەکانی بەکا گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). دواتر دەستەی نوێنەرایەتی مناڵەکانی فەزارە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) کەخارجە کوڕی حسن لەناویاندا بوو. هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی سەعلەبە کوڕی مونقد گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و دەستەی نوێنەرایەتی سەعد کوڕی بەکر بەسەرپەرەستی زمام کوڕی سەعلەبە خۆیان گەیاندە مەدینە. ئەو ئایینەکانی ئیسلامی لەپێغەمبەر(د.خ) وەرگرت و باوەڕی هێنا. کاتێك گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی، پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر ڕاست بکات، بێ گومان یەکسەر بۆ بەهەشت دەڕوات. کاتێك گەشتە لای خەڵکەکەی خۆی، لای ئەو کۆبوونەوە و یەکەم قسەی ئەوە بوو، بەنەحلەت بن لات و عوازا! وتیان: لەپیسی و گولی و شێتی بترسە. وتی: هاوار لەئێوە، ئەم دووانە زیان و سود بەئێوە ناگەیێنن. خوا پێغەمبەریکی ناردووە و لەگەڵ ئەودا نوسراوێك و ئێوەی لەم ژیانەی فێڕۆیەیی ئێستا ڕزگار کردووە. ئەو باوەڕ هێنانی خۆی ئاشکرا کرد. لەو ڕۆژەدا لەسەراسەری شارەکەی ئەو ژن وپیاوێکی بتپەرەست نەمانەوە، چوونکە هەموویان باوەڕیان بەئیسلام هێنا. نەبیستراوە هیچ دەستەیەکی نوێنەرایەتی پیرۆزتر لەدەستەی زمام کوڕی سەعلەبە بێت.

## حەج کردنی ئەبوبەکر

لەم کاتەدا ئەبوبەکر هاوریێ لەگەڵ بیست وشتری پێغەمبەر(د.خ) و پێنج وشتری خۆی، لەگەڵ سێسەد پیاو حەجی کرد. کاتێك گەشتە زی حەلیفە، پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوری ئەبی تالبی بەدوادا نارد و فەرمووی سورەی بێزاری (برائت) بۆ بتپەرستەکان بخوێنێتەوە. ئەبوبەکر گەرایەوە و وتی: ئایا لەمندا شتێك هەیە؟ وتی: نە، بەلاّم پەیامی پێغەمبەریی خۆم جگە لەخۆم یا پیاوێك لەپیاوەکانی خۆم بەخەڵکی راناگەیینێت. ئەی ئەبوبەکر ئایا بەم رازی نیت هاورێی من بوویت لەئەشکەوت و هاوریێ لەگەڵ من لەبەهەشتا لەسەر لێواری ئەستێرێك دەبێت؟ وتی: بەڵێ. ئەبوبەکر رێورەسمی حەجی ئەنجامدا. خەڵك حەجیان کرد و عەرەبەکان و ناباوەران بەشێوازی خۆیان حەجیان کرد. عەلی کوری ئەبی تالیب هاواری دەکرد و بێزاری خوا و پێغەمبەری لەبتپەرستەکان جاردەدا. رۆژی جەژنی قوربان هاواری کرد: دوای ئەم ساڵ، هیچ بتپەرستێك حەج ناکات و هیچ کەس بەرووتی بەدەوری ماڵی خوادا ناسورێتەوە. هەر کەس لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی هەیە تا کۆتایی زەمان رێزی لێبگرێت. بتپەرستەکان گەرانەوە و یەکتریان سەرکۆنە دەکرد و وتیان: قورەیشییەکان باوەریان بەئیسلام هێنا، لەم سەرسەختییە چ سود؟ ئەوانیش باوەریان هێنا.

## رووداوەکانیتر

لەم ساڵەدا دانی زەکات و هاوشێوەکانی پێویست کرا. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانرەواکانی خۆی بۆ سەرزەمینەکانی ژێر فەرمانی نارد.

لەم ساڵەدا لەشەعبان /مۆڤەمبەر ٦٣٠ دایکی کولسوم کچی پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری عوسمان کوری عەففان کۆچی دوایی کرد. ئەسمە کچی عومەیس و سەفیە کوری عەبدولموتەلیب ئەویان شۆرد. دەستەیەك دەڵێن: چەندین ژن لەئەنسار ئەویان شۆرد. پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەسەر کرد. لەناو ئەو ژنانەی

ئەویان شۆرد، دایکی عەتیە بوو. باوکی تەلحە ڕۆشتە ناو ئارامگاکەی ئەو.

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەلول سەرکردەی دووڕووەکان مرد. دەسپێکی نەخۆشی ئەو لەمانگی شەوال /ژانویە ٦٣١ زایینی بوو و کاتێك مرد، کوڕەکەی عەبدوڵڵە هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای کراسەکەی ئەوی کرد. باوکی بەوە کفن کرد. پێغەمبەر(د.خ) هات تا نوێژی لەسەر بخوێنێت. عومەر هات و لەبەرابەریدا وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئایا نوێژ لەسەر ئەو دەخوێنیت کە لەفلأن ڕۆژ و فلأن ڕۆژ ئەوە و ئەمەی وت؟ ئەو ڕۆژەکانی یەك یەك بژارد و پێغەمبەر(د.خ) پێدەکەنی. وتی: ئەی عومەر: بڕۆ ئەو لاوە کەمنیان ئازاد کردووە و من هەڵبژاردنی خۆمم کردووە. بەمن وترا: بۆ ئەوان داوای لێخۆشبوون بکە یا مەیکە، ئەگەر بۆ ئەوان حەفتا جار داوای لێخۆشبوون بکەیت، خوا لەوان خۆش نابێت (توبە/٩/٨٠). ئەگەر دەمزانی لەحەفتاجار زیاتر سودی دەبێت، زیاتر لەحەفتاجار داوای لێخۆشبوونم بۆ دەکردن. ئەوکات نوێژی لەسەر ئەو خوێند و لەسەر ئارامگاکەی وەستا. خوای گەورە ئەم ئایەی نارد: هیچ کات نوێژ لەسەر مردووەکانی ئەوان مەکە و لەسەر گۆڕەکەیان مەوەستە. ئەوان بەخوا وپێغەمبەرەکەی ناباوەڕ مانەوە و مردن و خراپەکاران بوون (توبە٩/٤٨).

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) هەواڵی مردنی نەجاشی بەموسوڵمانەکاندا. مەرگی ئەو لەرەجەبی ساڵی نۆیەم /ئۆکتۆبەر ٦٣٠ زایینی بوو. پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەسەر خوێند. هەروەها لەم ساڵەدا ئەبوعامری پارسا لای نەجاشی کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دەیەمی کۆچی( ٦٣٢ زایینی )

## دەستەی نوێنەرایەتی نەجران هاوڕێ لەگەڵ عاقب و سەید

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) خالید کوڕی وەلیدی ڕەوانەی لای مناڵەکانی حارس کوڕی کەعب کرد و فەرمانی پێدا بۆ سێ جار بۆ سەر ئیسلام بانگێشتیان بکات و ئەگەر ڕازی بوون لەناو ئەواندا بمێنێتەوە و فێرکارییەکانی ئیسلامیان فێر بکات و ئەگەر ڕازی نەبوون، شەڕیان لەگەڵ بکات. خالید ڕۆشتە لای ئەوان و بۆ باوەڕهێنان هانیدان. ئەوان وەڵامیان دایەوە و باوەڕیان بەئیسلام هێنا. خالید لەناو ئەواندا مایەوە و نامەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی و ئاگاداری کردەوە. خالید گەڕایەوە و دەستەی نوێنەرایەتی نەجران هاوڕێ لەگەڵ قەیس کوڕی حوسەین کوڕی یەزید کوڕی قینان زی غوسە و یەزید کوڕی عەبدولمەلەدان، هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەوان ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). دواتر لەکۆتاییەکانی شەوال یا زیحەججە/ژانویە یا فەوریە ٦٣٢ زایینی لای ئەو گەڕانەوە. پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی حەزمی لەگەڵ ئەوان نارد تا فێرکارییەکانی ئیسلامیان فێر بکات و خێر و زەکاتیان لێوەربگرێت و کۆی بکاتەوە. لەمبارەوە نامەیەکی بۆ نووسی. پێغەمبەر(د.خ) مرد و عەمرۆ کوڕی حەزم سەروەری نەجران بوو.

مەسیحیەکانی نەجران، عاقب و سەیدییان لەگەڵ چەند کەسێکیتر ناردە لای پێغەمبەر(د.خ). داوایان لێکرد لەسەر نفرینکردن گرێو بکەن بەو مەرجەی ژنان و مناڵان و خزمەکان لەهەردوو کۆببنەوە و لەخوا بپاڕێنەوە و بڵێن: لەناو ئێمە دوو دەستە، نفرینی خوا لەدرۆزن بێت. پێغەمبەر(د.خ) هات و عەلی و فاتیمە و حەسەن و حسێن هاوڕێیەتیان دەکرد. کاتێك مەسیحییەکان ئەوانیان بینی، وتیان: ئەمانە ئەو کەسانەن کەئەگەر خوا سوێند بدەن تا هەموو چیاکانی دنیا لەبن هەڵکەنێت، خوا ئەو کارە دەکات. ئەوان دەستبەرداری داواکەی خۆیان بوون. لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵی ڕێککەوتن کە دوهەزار (حلە) (هەر حلە ٤٠ درەم -- ٨٠٠٠٠ درەم)

و بدەن و ڕێز لەنێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) بگرن. پێغەمبەر(د.خ) بەڵێن و پەیمانی خوایی پێدان ئەوان و دینەکەیان بپارێزێت و لەوان دەیەك وەرنەگرێت. لەوانیش پەیمانی وەرگرت سوو نەخۆن و لەسەر بنەمای سووخۆری ئاڵوگۆڕ و بازرگانی نەکەن. کاتێك ئەبوبەکریش هاتەسەر کار بەمشێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن. کاتێك عومەر هاتەسەر کار، باوەڕداران بەکتێبەکانیتری و مەسیحیەکانی نەجران لەحیجاز دەرکرد. دەستەیەك لەوان ڕۆشتنە شام و دەستەیەکیان ڕوویان لەنەجرانییەیی کوفە کرد. ئەو زەوی و باخ و بێستان و سامانەکانی لێکڕینەوە. دەستەیەك دەڵێن: ژمارەیان ڕووی لەزیاد بوون کردبوو و گەشتبوونە نزیکەی چل هەزار کەس. لەناو خۆیاندا ڕژدیان بەیەك برد و لەبەر ئەمە ڕۆشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب و وتیان: ئێمە لەم سەرزەمینە دووربخەرەوە. عومەر کوڕی خەتابیش لەوان بۆ سەر موسوڵمانەکان دەترسا و ئەم بیانووەی بەهەلزانی و ئەوانی کۆچ پێکرد. دواتر ئەوان پەشیمانبوونەوە و داوای لێبووردنیان لێکرد بەڵام عومەر رازی نەبوو. کاتێك عەلی بوو بەخەلیفە، هاتنە لای و وتیان: تۆ بەدەست نووسەکەی خۆت سوێند دەدەین (چوونکە نوسراوەکەی سەردەمی پێغەمبەر(د.خ) بەدەستی عەلی نوسرابوو). عەلی وتی: عومەر پیاوێکی راست کردار بوو و من پەسەندی ناکەم لەگەڵ کارەکانی ئەو ناسازگاری بکەم. عوسمان دوو سەد (حلەی) بەوان بەخشیبوو. فەرمانڕەوای نەجرانییەی کوفە کەسی بۆ شام و دەوروبەری دەنارد و لەنەجرانییەکان حلەی کۆدەکردەوە.

کاتێك معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و یەزید کوڕی معاویە هاتنە سەرکار، نەجرانییەکان لەبلاوبوونەوە و مردن و باوەڕهێنانی زۆر لەکەسەکانی خۆیان گلەییان کرد چوونکە ژمارەیان ڕووی لەکەمی کردبوو. ئەوان نامەکەی عوسمانیان نیشاندا و ئەو دمووەسەد حلەی تری لەوان کەمکردەوە کەبوو بەچوارسەد. کاتێك حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی بوو بەفەرمانڕەوایی عێراق و عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس لێی راپەڕی، جوتیارانی بەهاوڕێیەتی و پشتیوانی ئەو تاوانبار کرد هەروەها مەسیحییەکانی نەجران. ئەوانی بەهەزار و سێسەد حلە گەڕاندەوە و حلەی رەنگاورەنگ و نگارینی لێوەرگرتن. کاتێك عومەر کوڕی

عەبدولعـەزیز هاتەسـەر کـار، لـە لەناوچـوونی خۆیـان و شـەڕی عەرەبـەکان بـۆ تالآنگـەری و سـتەمکاری حـەجاج کـوڕی یوسـف لـەوان، گلـەیی و گازنـدەیان کـرد. فەرمانیدا سـەرژمێری بکـەن و بینیـان بۆ یـەك لەسـەر دە ژمارەیـان کۆبۆتـەوە. وتـی: ئەم ئاشتییە بەباج دەبینم. هیچ باجێك لەسەر زەوییەکانی ئەوان نییە و ئەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە یـان مـردوون، باجیـان لەسەر نامێنێت. ئـەوانی ناچـار بـەدانی چوارسەد حلە کرد. کاتێك یوسف کوڕی عومـەری سـەقەفی هاتەسـەر کـار، وەك ڕق و کینە بەرابەر بەحەجاج کوڕی یوسف، ئەوانی بۆ بارودۆخی یەکەمیان گەڕاندەوە. کاتێـك خوێنڕێـژ (ئەبولعەباسـی سـەفاح) یەکـەم خەلیفـە عەباسـی هاتەسـەر کـار، ڕوویـانکردە ڕێگاکـەی ئـەو، ئـەو ڕۆژەی لەکوفـە دەرکـەوت. ئـەوان بەسـەر ڕێگاکـەی گوڵ و گیایان بلاّو کردەوە و دەستەی ڕازاوەیان دانیشاند و زێڕیـان بەخشییەوە. ئەو بەم کارەی ئەوان شادمان بوو. ئەوسا چارەنوسی خۆیـان بردە لای و لەرێگـەی خاڵەکانییـەوە، منداڵـەکانی حـارس کـوڕی کـەعب لـەو نزیکبوونـەوە. عەبدوڵڵـە کـوڕی حـارس سـەبارەت بـەوان قسـەی کـرد و ئـەوانی بەدووسـەد حلـە گەڕانـدەوە. کاتێـك ڕەشـید بـوو بەخەلیفـە، لـە بەڕێوبـەران لای ئـەو گلـەییان کـرد. ڕەشـید فەرمانیـدا لەزیانی بەڕێوبەران پارێزراو بن و باجی خۆیان یەکراست بێنن بۆ گەنجینە.

## ڕووداوەکانیتر

لـەم سـاڵەدا لـەمانگی شـەوال/ ژانویـەی ٦٣٢ زایـینی دەسـتەی نوێنەرایـەتی سـەلامان پێکهـاتوو لەحـەوت کـەس بەسەرپەرەسـتی حـەبیبی سـەلامانی هاتـە لای پێغەمبەر(د.خ). هەروەها لەم ساڵەدا لەرەمـەزان / دێسامبەر ٦٣١ زاییـنی دەسـتەی نوێنەرایـەتی غوبـشان گەشـتن. عامرییـەکانیش لـەمانگی رەمـەزان گەشـتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

لەم ساڵەدا نوێنەرانی ئەزد بەسەرکردایەتی سورە کوڕی عەبدوڵڵە پێکهاتوو لەدە وچەند پیاوێك هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەو بـاوەڕی هێنـا و پێغەمبـەر(د.خ) ئـەوی کردە فەرمانڕەوایی خەڵکەکەی خۆی و فـەرمانی پێدا شـەڕی بتپەرەستەکان بکـات.

ئەو ڕەوانەی شارەکەی، جورەش بوو کەچەندین هۆز لەیەمەن ( و لەناو ئەواند خەسعەم) لەوێ دەژیان. ئەو بۆ نزیکەی مانگێك ئەوانی گەمارۆدا. ئەوان زۆر بەباشی پارێزگاری و بەرگرییان لەخۆیان کرد. گەڕایەوە و کاتێك گەشتە کێوێك بەناوی (کشر)، خەڵکی جورەش گومانیان برد شکستی خواردوە و لەبەر ئەمە شوێنیکەوتن تا بیدۆزنەوە و بیگرن. سورەد گەڕایەوە و ڕووبەڕوویان بوویەوە و بوێرانە شەڕی لەگەڵ کردن. خەڵکانی جورەش دوو پیاویان نارده لای پێغەمبەر(د.خ) تا لەچۆنییەتی کاروبارەکانی بڕوانن. لەو کاتەی لای پێغەمبەر(د.خ) بوون، لەناکاو وتی: کام یەك لەشارەکانی ئێوە ناوی (شوکرە)؟ وتیان: لەسەرزەمینی ئێمە چیاییەکی لێیە بەناوی کشر. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەوە کشر نییە بەڵکو شوکر و هەرئێستا وشترە قوربانییەکانی خواوەند لەوێ قوربانی دەکرێن. (جێگەی شوکر و سوپاسە کەئێستاکە هاوڕێیانی من، خەڵکەکەی ئێوە بەشمشێر دەکوژن). ئەبوبەکر یا عوسمان بەم دووانەی وت: هاوار لەئێوە، ئەو هەواڵی مەرگی خەڵکەکەتان بەئێوە دەدات. داوای لێبکەن تا داوا لەخوا بکات زیان لەخەڵکەکەی ئێوە دوور بکاتەوە. ئەوان داویان کرد. پێغەمبەر(د.خ) وتی: خوایە زیان لەوان دوور بکەرەوە. ئەو دووانە گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەیان و بینیان لەهەمان ڕۆژ، لەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) هەواڵەکەی پێدابوون، کوشتار کراون. دەستەی نوێنەرایەتی جورەش هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ)و باوەڕیان هێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا مورادییەکان هاورێ لەگەڵ فەروە کوڕی موسەیەکی موراد‌ی گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)و پشتیان کردە پاشای کەندە. ماوەیەك دوای دەرکەوتنی ئیسلام لەنێوان دوو هۆزی موراد و هەمدان شەڕێك ڕوویدا و هەمدانییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و مورادییەکانیان بەسەختی کوشتار کرد. ئەو ڕۆژەیان بەرۆژی (ڕەزم) ناوبرد. سەرۆکی هەمدان ئەجدەع کوڕی مالك کوڕی باوکی مەسروق بوو. فەروە لەمبارەوە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| فان نغلب فغلابون قدما | و ان نهزم فغير مهز مينا |
| و ما ان طبنا جبن و لكن | منايانا و دولة آخرينا |
| كذاك الدهر دولته سجال | نكر سروفه حينا و حينا |

| | |
|---|---|
| فبينا ما يسر به و يرضى | و لولبست غضارته سنينا |
| اذا انقلبت به كرات دهر | فالفى للاولى غبطوا طحينا |
| ومن يغبط بريب الدهر منهم | يجد ريب الزمان له خؤونا |
| فلو خلد الملوك اذا خلدنا | ولو بقى الكرام اذا بقينا |
| فافنى ذاكم سروات قومى | كما افنى القرون ثةلثةوقلينا |

واتاكەی: ئەگەر سەرکەوین، لەبەر ئەوەیە بەردەوام بەسەختی سەرکەوتوو بووین و ئەگەر شکەست بێنین شانازییە کە لەشکستخواردووان هەژمار نەکراوین. عادەتی ئێمە ڕیسوایی و سوکی نییە، دەرد ئەوەیە ئێمە دەمرین و کەسانیتر دێنە سەرکار. فەرمانڕەوایی جیهان بەمشێوەیە هەندێ کات لەبەرژوەندیدایە و هەندێ کات لەزیان، سوڕانەکانی زەمان بەردەوام هێرش دەکەنە سەر خەڵکان. لەو کاتەی سوڕانی زەمان هۆکاری شادمانی و ڕەزامەندییە – و لەو کاتەی شادییەکەی وەك جل و بەرگ جەستە دادەپۆشێت – لەناکاو هێرشی تاڵییەکانی ڕۆژگار دێنەپێش و ئەوانەی هۆکارێك بوون بۆ ڕژدی بردنی کەسانیتر، وەك ئارد دەهارێت. هەرکەس شەیدای سوڕانی زەمانە بێت، سوڕانەکەی وەك فریوبازێك دەبینێت. ئەگەر پاشاکان نەمر دەبوون، و ئەگەر خەڵکانی بەرێز دەمانەوە، ئێمە دەماینەوە. تەنیا ئەمە، سەروەرانی خەڵکەکەی منی بەرەو لەناوچوون برد بەهەمان شێوە کەخەڵکانی ڕۆژگاری پێشوی لەناو برد.

کاتێك فەروە ڕوویکردە پێغەمبەر(د.خ) و لەخەڵکەکەی خۆی جیابوویەوە، ئەمەی وت:

| | |
|---|---|
| لما رايت ملوك كندة اعرضت | كالرجل خان الرجل عرق نسائها |
| يممت راحلتى اوم محمدا | ارجو فضائلها وحسن ثرائها |

واتاكەی: کاتێك پاشاکانی کەندەم بینی کە پشتیان کردە من و وەك قاچێك کە لەبەر نەخۆشی فێڵ لەقاچەکەی تر دەکات، خیانەتیان لەمن کرد، سوار چوارپێکەم بووم و ڕوومکردە محەممەد و هیوام بەبەخشین و توانایییەکەی بەست.

کاتێك گەشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، پێی وت: ئەی فەروە، ئایا لەوەی لەڕۆژی ڕەزم

بەسەر خەڵکەکەت هات، ڕەنجاوی؟ وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، چ کەسێك دەتوانێت ئەگەر خەڵکەکەی گیرۆدەی زیانێك وەك زیانی خەڵکەکەی من بێت، نەڕەنجێت؟ پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەم کارە جگە لەباشە و چاکەی بۆ خەڵکەکەی تۆ بەدواوە نەبوو. دواتر پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە فەرمانڕەوایی هەموو خەڵکانی موراد و زوبەید و مەزجیح و خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسی کردە هاوڕێی. ئەو تا کاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) سەرپەرەستی خێرات بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا فەروە کوڕی عەمرۆ جوزامی نەفایی نێردراوێکی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و لەباوەڕهێنانی خۆی ئاگاداری کردەوە و ئێسترێکی سپی وەك دیاری بۆ نارد. فەروە فەرمانڕەوایی عەرەبەکان لەدەوروبەری ڕۆمییەکان بوو. شوێنی مانەوەی شاری مەعان لەسەرزەمینی شام (وڵاتی ئەردەنی ئێستا) بوو. کاتێك هەواڵی باوەڕهێنانی ئەو بەرۆمییەکان گەیشت، شوێنیکەوتن و ئەویان دیل و زیندانی کرد. ئەو لەزندان ئەم شێعرەی وت:

| | |
|---|---|
| طرقت سليمى موهنا فشجاني | والروم بين الباب و القربان |
| صد الخيال و ساءه ما قد راى | و هممت ان اغفى و قد ابكانى |
| لا تكحلن العين بعدى اثمدا | سلمى و لا تدنن للانسان |

واتاکەی: دڵدارەکەی من لەکاتی شەو لەدەرگایدا و ئەم کارەی خەمباری کردم و ڕۆمییەکان لەنێوان دەرگا و کوشتارگان. ئەوەی بەئەندێشەمدا هات، لەگەڕان دووری خستەوە و ڕەنجاندی. ویستم سەرخەوێك بشکێنم بەڵام گریان ئارامی لێ سەندم. سەلمای نازەنین، دوای من سورمە بەچاوە جوانەکانی خۆتا مەهێنە و دوای من لەهیچ کەس نزیك مەبەرەوە.

دواتر ڕۆمییەکان لەسەر ئاوێك بەناوی (عفرء ) لەفەلەستین کۆبوونەوە تا لەداری بدەن. وتی:

| | |
|---|---|
| الاهل الى سلمى بان خليلها | على ماء عفرى فوق احدى الرواحل |
| على ناقة لم يلقح الفحل امها | مشذبة اطرافها بالمناجل |

واتاکەی: ئایا ئەم هەواڵە بەسەلمای نازەنینی من گەشتووە کەهاورێکەی لەسەر ئاوی عیفرء سواری سەمەندێك بووە، سوار وشترێکی مێ بووە کەهیچ وشترێکی

نێر لێی نزیك نەبۆتەوە، و هەر سوچ و قۆژبنێکیان بەداس ڕازاندۆتەوە ( و ئەمەی داری ئیعدامە).

ئەمە لە بەیتە مانادارەکانە. کاتێك نزیکیان کردەوە تا لەداری بدەن، وتی:

بلغ سراة المسلمين بانني سلم لربي اعظمي و مقامي

واتاکەی: لەمن بۆ موسوڵمانەکان پەیام ببە کەمن سەرسپێردراوی خواکەی خۆمم، ئێسقانەکان و جەستەیشم.

ئەوسا ئەویان بەدارەوە هەڵواسی.

هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی زوبەید هاوڕێ لەگەڵ عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) لەم ساڵەدا پێش هاتنی مەعدی کەرب، فەروە کوڕی موسەیەکی کردبووە فەرمانڕەوای زوبەید و موراد. کاتێك عەمرۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە، لەناو خەڵکەکەی، مناڵەکانی زوبەید مایەوە و فەروە فەرمانڕەوای ئەوان بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، عەمرۆ لەدین هەڵگەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی عەبدولقەیس هاوڕێ لەگەڵ جارود کوڕی عەمرۆ هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەو مەسیحی بوو و دواتر باوەڕی هێنا و هاورێکانیشی باوەڕیان هێنا. جارود کەسێکی خواپەرەست بوو. ئەو دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) رێگر بوو لەهەڵگەڕانەوەی خەڵکەکەی لەدین و ئەمە لەکاتێکدا بوو لەگەڵ ئەو پیاوە فریودراوە، نەعمان کوڕی مونزەر لەدین هەڵگەڕانەوە. پێغەمبەر(د.خ) پێش گرتنی مەککە، عەلا کوڕی حەزرەمی ڕەوانەی لای مونزەر کوڕی ساوی عەبدی کردبوو. مونزە باوەڕی هێنا و لەسەر ئیسلامەکەی خۆی مایەوە. ئەو دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) پێش هەڵگەڕانەوەی خەڵکی بەحرەین لەئاینی ئیسلام، کۆچی دوایی کرد. لەم کاتەدا عەلا کوڕی حەزرەمی فەرمانڕەوای بەحرەین بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی مناڵەکانی حەنیفە هاوڕێ لەگەڵ موسەیلەمە گەشتنە مەدینە. شوێنی مانەوەیان ماڵی کچی حارس یەکێك لە خاتونە ئەنسارییەکان بوو. موسەیلەمە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆبوویەوە و دواتر گەڕایەوە

بۆ یەمامە و نازناوی پێغەمبەری لەخۆی بەست و درۆی فراوانی کرد و واینیشاندا شەریکی پێغەمبەرە لەپێغەمبەرایەتیدا. منداڵەکانی حەنیفە شوێنی کەوتن.

هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی کەندە هاوریێ لەگەڵ ئەشعەس کوڕی قەیس پێکهاتوو لەشەست سوارە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەشعەس وتی: ئێمە کوڕانی ئاکل ئەلمورارین و تۆیش کوڕی ئاکل ئەلموراریت. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئێمە کوڕانی نەزر کوڕی کەنانەین، شوێن دایکانی خۆمان ناکەوین و پشت ناکەینە باوکانی خۆمان.

دەستەی نوێنەرایەتی مەحاریب و دەستەی نوێنەرایەتی ڕەهاوییەکان (تایەفەیەك لەمەزجح) لەم ساڵەدا هاتنە مەدینە. هەروەها دەستەی نوێنەرایەتی عەبەس و سەدیف و خولان پێکهاتوو لەدە کەس هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و سەدیفییەکان لە حەجی ماڵئاوایی چاویان بەپێغەمبەر(د.خ) کەوت.

لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی عامر کوڕی سەعسەسە هاوریێ لەگەڵ عامر کوڕی توفەیل وئەربەد کوڕی قەیس و جەبار کوڕی سولمە کوڕی مالك کوڕی جەعفەر گەشتنە مەدینە. عامر دەیویست فێڵ لەپێغەمبەر(د.خ) بکات. خەڵککەی پێیان وت: خەڵکان باوەڕیان بەئیسلام هێناوە، تۆیش باوەڕ بێنە. وتی من شوێن ئەم گەنجە ناکەوم. دواتر بەئەربەدی وت: کاتێك دەچینە لای ئەو، من سەرقاڵی دەکەم و تۆ شمشێرەکەت بەرز بکەرەوە و لەپشتەوە لێی بدە. کاتێك هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، عامر گفتوگۆی دەستپێکرد و سەرقاڵی کرد تا ئەربەد لەناکاو بیکوژێت. ئەربەد هیچ کارێکی نەکرد. لەم کاتەدا عامر بەپێغەمبەری وت: سەراسەری ئەم دەشتە لێوانلێو دەکەم لەشەڕکەران دژی تۆ. کاتێك ڕۆشت، پێغەمبەر(د.خ)، وتی: ئەی خوایە، زیانی عامر لەمن دووربکەرەوە. کاتێك هاتنەدەر، عامر بەئەربەدی وت: بۆ بەشمشێر نەتکوشت؟ ئەربەد وتی: هەرجار مەبەستی کوشتنی ئەوم کرد، تۆکەوتیتە نێوان من و ئەو بەشێوەیەك جگە لەتۆ کەسم نەدەبینی، ئایا بەشمشێر لەتۆم بدایە؟ ئەوان گەڕانەوە. کاتێك ماوەیەکیان لەڕێگا بڕی، خوا تاعونی بۆ عامر کوڕی توفەیل ناردە خوار و لەناوی برد. ئەو لەماڵی ژنێکی سەلولی کەوت. گیانیدەدا و دەیوت: ئەی منداڵەکانی عامر، ئایا غودەیەك

وەك غودەی وشتر و مەرگ لەماڵی ژنێکی سەلولی! خواوەند هەورە بروسەکەیەکی بۆ ئەربەد نارد و لەناوی برد. ئەربەد کوڕی قەیس برای (لەدایکەوە) لوبەید کوڕی رەبیعە بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا دەستەی نوێنەرایەتی تەی هاوڕێ لەگەڵ زەیدئەلخەیل، سەروەرەکەیان، گەشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەوان باوەڕیان هێنا و لەسەر باوەڕەکەی خۆیان مانەوە. پێغەمبەر(د.خ) وتی: وەسفی هیچ کام لەعەرەبەکانیان نەکرد مەگەر ئەوەی هاتە لای من، و ئەوم بەنەشیاوتر لەو وەسفە بینی جگە لەو وەسفەی سەبارەت بەزەید ئەلخەیل وتیان (چوونکە ئەو شیاوتر بوو). دواتر ئەوە ناوینا زەیدئەلخەیر و فید وسەرزەمینەکانی بەو بەخشی. ئەو لەگەڕانەوە لەیەکێك لەدێهاتەکانی نەجد گیردەی تا بوو وکۆچی دوایی کرد و لەوێ بەخاك سپێردرا.

هەروەها لەم ساڵەودا موسەیلەمەی درۆزن نامەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی و بیری هێنایەوە کەلە پێغەمبەریدا شەریکیەتی. نامەکەی بەدوو نێردراو نارد. پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەو لەو دوو کەسە پرسیاری کرد و ئەم دووانە ئەویان بەراستگۆ زانی. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر رێگە دەدرا نێردراوان بکوژم، ئێوە دووانەم دەکوشت.

نامەکەی موسەیلەمە بەمشێوە بوو: لەموسەیلەمە پێغەمبەری خوا بۆ محەممەد پێغەمبەر(د.خ) خوا. بەلاّم دواتر، من لەم کارەدا لەگەڵ تۆ بوومە شەریك، نیوەی زەمین بۆ ئێمە بێت و نیوەی بۆ قوڕەیش. بەلاّم قوڕەیشییەکان پێبەندی رێگەی راست نین.

پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ نووسی: لەمحەممەد پێغەمبەر(د.خ) خوا بۆ موسەیلەمەی درۆزن. بەلاّم دواتر، سلاّو لەو کەسەی شوێن راستی و دروستی دەکەوێت. زەمین هی خوایە، بەهەرکەس بیەوێت، دەیبەخشێت و ئەنجامەکەی بۆ خۆپارێزانە.

دەستەیەك دەڵێن: بانگەشەی پێغەمبەری کردنی موسەیلەمە و کەسانیتر دوای حەجی ماڵئاوایی و نەخۆشی پێغەمبەر(د.خ) بوو کەلەئازارەکەی گیانی ئەسپەردە کرد. کاتێك خەڵك هەواڵی نەخۆشی ئەویان بیست، ئەسوەد عەنسی لەیەمەن،

موسـەیلەمە لەیەمـەن و تەڵیحـە لـەناو مناڵـەکانی ئەسـەد، بانگەشـەی پێغەمبـەریان کرد.

## ناردنی عەلی بۆ یەمەن و باوەڕهێنانی هەمدان

لـەم سـاڵەدا پێغەمبـەر(د.خ) عـەلی کـوڕی ئـەبی تـالیبی بـۆ هەمـدان نـارد. پێشتر خالیـد کـوڕی وەلیـدی ناردبوو تـا یەمانییـەکان بـۆ سـەر ئیسلام بـانگ بکـات بـەلاَم ئـەوان رازی نـەبووبوون. لـەم کاتـەدا عـەلی نـارد و فـەرمانی پێدا خالیـد و هـەرکام لـەهاوەلاَنی کەدەیـەوێت، بگەڕێنێتـەوە. عـەلی ئـەم کـارەی کـرد. عـەلی نامـەی پێغەمبـەری بۆخـەڵکی یەمـەن خوێنـدەوە و هەمدانییـەکان هـەموویان لەیـەك رۆژدا باوەڕیـان هێنـا. ئـەم هەواڵـەی بەپێغەمبـەر(د.خ) گەیانـد و پێغەمبـەر(د.خ) سـێ جـار وتـی: سلاَو لەهەمدان. دواتر یەمانییەکان یەك لەدوای یەك باوەڕیان بەئیسلام هێنـا. عـەلی ئـەم هەواڵـەی بەپێغەمبـەر(د.خ) گەیانـد و ئـەو سـەری لـەزەوی سـوو و وەك سوپاس کوڕنوشی بۆ خوا برد.

## ڕەوانە کردنی کارگوزارانی خێرات لەلایەن پێغەمبەر(د.خ)ەوە

هـەروەها لـەم سـاڵەدا پێغەمبـەر(د.خ) کـارگوزاران و فـەرمانڕەوایانی خـۆی بـۆ خێرات ڕەوانە کرد. موهاجیر کوڕی ئەبی ئومەییە کوڕی موغەیرەی بۆ سەنعا نارد کەلەکاتی بوونی ئەو لەم سەرزەمینە، عەنسا (پێغەمبەر ئاسا) هاتە لای ئەو. زیاد کوڕی لوبەیدی ئەنساری نارد بۆ حەزەرمەوت و ئەوی کردە کارگوزاری خێراتی ئەم سەرزەمینە. عودەی کوڕی حاتـەمی تـایی نـارد بـۆ سـەرزەمینی خێراتـی ئەسـەد و تەی. مالك کوڕی نوەیرەی بۆ سەرزەمینی مناڵەکانی حەنزەلە نارد، زەبرقان کوڕی بەدر و قـەیس کـوڕی عـاسمی بـۆ خێراتـی سـەعد کوڕی زەیـد کـوڕی مـەنات کـوڕی تەمیم، عەلا کوڕی حەزرەمی بەرەو بەحرەین و عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیبی رەوانـەی نەجران کرد تاخێرات و باجی ئەوان کۆبکاتەوە و بگەڕێتەوە. عەلی ئەم کارەی کـرد و گەڕایـەو و لەحـەجی ماڵئـاوایی چـاوی بەپێغەمبـەر(د.خ) کـەوت. عـەلی پیاوێـك

لەهاوەڵانی کردە جێگری خۆی لەناو سوپاکەی و دوای ئەوە خۆی گەیاندە مەککە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). ئەو پیاوە رووپکردە پارچەکان و بەهەموو پیاوەکان لەوەی عەلی هێنابووی، حلەیەکی پۆشاند. کاتێك سوپاکە نزیك بوونەوە، عەلی رۆشتە پێشوازییان تا بەخێرهاتنیان بکات. ئەو حلەکانی لەبەر ئەواندا بینی و هەمووی لێوەرگرتنەوە. ئەوان لای پێغەمبەر(د.خ) گلەییان کرد. پێغەمبەر(د.خ) هەستا، وتاریدا و وتی: ئەی خەڵکینە، گلەیی لەعەلی مەکەن کە ئەو لەرێگەی خواوەند وبۆ خواوەند، لەهەمووان سەختگیرترە.

## حەج ماڵئاوایی

پێغەمبەر(د.خ) پێنج رۆژی کۆتایی مانگی زیقەعدە / ٢٢ فەوریەی ٦٣٢ زایینی بۆ حەج رۆشتەدەر و خەڵك جگە لەئایینی حەج هیچ وتارێکیان نەدەهێنایە سەرزمان. کاتێك گەشتنە (سەریف)، فەرمانی بەخەڵکدا جگە لەبەرەو پێش بەرانی قوربانییەکان، حەجێکی عەمرە بکەن. پێغەمبەر(د.خ) و دەستەیەك لەهاورێکانی قوربانییەکانیان بۆ پێش بردبوو. عەلی کوری ئەبی تالیب لەکاتی ئیحرام چاوی پێیکەوت. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: حەجی عەمرە بکە بەهەمان شێوە کەهاورێکانت حەجیان کرد. عەلی وتی: منیش ناوی خوا بەسەر ئەو ئاژەڵە قوربانیانە دەهێنم کە پێغەمبەری خوا هێنای. ئەو لەسەر ئیحرامی خۆی مایەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئاژەڵە قوربانییەکانی لەلایەن خۆی و عەلییەوە سەربری. ئەو رێبەری خەڵکی لەکاتی حەجکردن گرتە ئەستۆ و لەپێش ئەوانەوە حەجی کرد و ئایینەکانی حەجی فێر کردن و وتاری بەناوبانگی خۆی خوێندەوە و ئەوەی پێویست بوو، بۆ خەڵکی روونکردەوە. ئەو کەسەی وتەکانی ئەوی لەعەرەفە بەخەڵك دەگەیاند، رەبیعە کوری ئومەییە کوری خەلەف بوو و ئەم کارەی لەبەر زۆری خەڵکان دەکرد.

دوای پارانەوە لەخواوەند وتی:

ئەی خەڵکینە، بەجوانی گوێ لەقسەکانم بگرن چوونکە ئەگەری هەیە ساڵێکیتر، هەرگیز لەگەڵ ئێوە لەم شوێنەدا ئامادە نەبم. ئەی خەڵکینە، خوێن و سامانەکانی ئێوە بۆ یەك بەرێز و رشتن و فراندیان ناڕەوایە بەهەمان شێوە کەئەمرۆ ناڕەوایە.

هەر جۆرە سودێکی پارە لەناو ئێوەدا هەڵدەگیرێت و تەنیا سەرمایەکانتان پێدەبڕێت. هەموو ئەو سودەی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب لای خەڵك هەیەتی، پشت گوێ دەخرێت. هەر خوێنێك لەرۆژگاری جاهلی ڕژاوە، لەبیر دەکرێت. یەکەم خوێن کەمن پشت گوێی دەخەم و نایهێڵم خوێنی رەبیعە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیبە (ئەو منالێکی شیرەخۆرە لەناو منالەکانی لەیس بوو و هەزلییەکان خوێنیان ڕشت). ئەی خەڵکینە، شەیتان بەتەواوی هیوابڕاو بووە و دەزانێت هەرگیز لەسەرزەمینەکەی ئێوە پەرەستش ناکرێت بەلاَم فەرمانەکانی ئەو لەو دیو سنورەکانی شەیتان پەرەستییەوە ڕەوایە و ئەو بەو کارە سوك و نەشیاوانەی ئێوە ئەنجامی دەدەن، شادمانە. ئەی خەڵکینە( پشت گوێ خستنی ئایینەکانی شەڕ نەکردن لەمانگە نارەواکان بۆ مانگەکانیتر، پێداگرتن لەسەر ناباوەڕییە)(توبە/٣٧/٩). ئێستا رۆژگار لەسەر هەمان یاسا دەسوڕێت کەلەرۆژی نافراندنی بەفەرمانی خوا دەسوڕا. (ژمارەی مانگەکان لای خواوەند دوانزە مانگە)(توبە /٣٦/٩). ئەی خەڵکینە، لەگەڵ ژنان بەباشی هەڵسوکەوت بکەن و پێشنیار بەیەکتر بکەن لەگەڵ ژنان بەباشی هەڵسوکەوت بکەن.

ئەمە وتارێکی دوورودرێژە.

کاتێك لەعەرەفە وەستا، وتی ( و ئەو چیایەی لەسەری بوو نیشانیدا): ئێرە وێستگەیە وسەراسەری عەرەفە وێستگەیە. لەموزدەلیفە وتی: ئێرە وێستەگەیە و سەراسەری موزدەلیفە وێستگەیە. کاتێك لەمەنی قوربانی سەربڕی، فەرمووی، ئێرە کوشتارگایە و سەراسەری مەنی کوشتارگایە. دواتر پێغەمبەر(د.خ) حەجی کرد و ئەمەیان بەحەجی ماڵئاوایی و حەجی فەرمانگەیاندن ناوبرد لەبەر ئەوەی دوای ئەوە ئیتر پێغەمبەر(د.خ) حەجی نەکرد. ئەو حەج و چۆنییەتی حەج کردنی فێری خەڵکان کرد.

## ژمارەی شەڕەکانی پێغەمبەر(د.خ)

شەڕەکانی ئەو بەدوو شێوە بوو: ئەوانەی خۆی کردی و بە غەزوە ناوبرا و ئەوانەی لەشکری رەوانە کرد و ناوی سرییەیان پێبرا.

دوایین شەڕ کەخۆی فەرماندەیی لەئەستۆدابوو و پێغەمبەر(د.خ) پێی هەستا، شەڕی تەبوك بوو. هەموو ئەو شەڕانەی خۆی فەرماندە بوو، دەگاتە نۆزدە. واقدی دەڵێت: عێراقییەکان بەمشێوە دەگێڕنەوە و گێرانەوەکەی خۆیان دەگێڕنەوە بۆ زەید کوڕی ئەرقەم. ئەمە گێرانەوەیەکی ناڕاستە چوونکە شەڕی موتەی لەگەڵ عەبدوڵڵە کوڕی رەواحە ئەنجامدا و لەرێگا لەسەر چوارپێکەی ئەو و لەدوای ئەو سوار بووبوو. ئەو جگە لەسێ یاچوار شەڕ زیاتر لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) نەبوو. دەستەیەك دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) فەرماندەیی بیست و شەش شەڕی کرد و دەستەیەك دەڵێن: بیست و حەوت شەڕ. ئەو ئاماژەی بەبیست و شەش شەڕ داوە، خەیبەر و وادی ئەلقورای بەیەك زانیوە چوونکە ئەوو لەخەیبەرەوە نەگەڕایەوە بۆماڵەکەی خۆی. ئەوەی ئەم دوو شەڕەی بەجیا زانیوە شەڕەکانی بەبیست و حەوت داناوە چوونکە خەیبەری بەیەك شەڕ و وادی ئەلقورای بەشەڕێکیتر لەقەڵەم داوە.

یەکەم شەڕ کەخۆی فەرماندەیی کرد، وەدان یا ئەبوا بوو. شەڕەکانیتر بەدوای یەك بەمشێوە بوون: بوات لەپانتاییەکانی ڕەزوا، عوشەیرە، بەدری یەکەم لەگەڕان بەدوای کورز کوڕی جابر، بەدرێك کەقوڕەیشییەکان تیایدا کوشتار کران، منالەکانی سەلیم، سویق، غەتەفان کەهەمان شەڕی زی ئەمر بوو، بەحران لەحیجاز، ئوحود، خەندەق، منالەکانی قورەیزە، منالەکانی لەحیان لەهوزەیل، زی قەرد، منالەکانی موستەلیق، حودەیبیە، خەیبەر، عەمرەی قەزا، گرتنی مەککە، حونەین، تایف و تەبوك، ئەو لەناو ئەمانەدا لەنۆ شەڕیاندا خۆی شەڕی کرد: بەدر، ئوحود، خەندەق، منالەکانی قورەیزە، منالەکانی موستەلیق، خەیبەر، گرتنی مەککە، تایف و حونەین.

سەبارەت بەو شەڕانەی خۆی فەرماندەیی نەکرد و بە (سرایا) ناوبران، جیاوازی

زۆرە. دەستەیەك دەڵێن: سێ و پێنج شەڕ بوو لەنێوان شەڕ و لەشكر كێشان، دەستەیەك دەڵێن: چل و هەشت.

لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان / دێسامبەر ٦٣١ زایینی جەریر كوڕی عەبدوڵڵەی بەجلی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ زی خەلسە نارد تا وێرانی بكات كە لەتەبالە بوو و لەبەردی سپی دروست كرابوو. ئەمە بتی بەجیلە و خەسعەم و ئەزد (سراه) بوو. كاتێك هەواڵی وێرانبوونی بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت، كوڕنوشی برد و خوای گەورەی سوپاس كرد.

## ژمارەی حەجەكانی پێغەمبەر(د.خ) و عەمرەكانی

جابر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دووجار حەجی كرد: حەجێك پێش كۆچكردن بۆ مەككە و حەجێك دوای كۆچكردن بۆ ئەم شارە كەعەمرەیەكیشی لەگەڵدا بوو. كوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سێ حەجی كرد. عایشە دەڵێت: چوار عەمرەی كرد. كوڕی عومەریش دەڵێت چوار عەمرەی كرد.

## تایبەتمەندیەكانی پێغەمبەر(د.خ)، ناوەكانی پێغەمبەر(د.خ) و مۆری ئەو

عەلی كوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) نە بالاَ بەرز بوو، نەكورتە بالاَ، سەرێكی گەورەی بوو و ریشێكی پڕ، دەست و پێی گەورە و جومگەكانی ئەستور، ڕوخساری كەمێك سورباو، موی سەرسنگی زۆر و درێژ، كاتێك بەرێگادا دەڕۆشت بۆ پێشەوە دەنووشتایەوە وەك بڵێی لەسەرەو خواریدا دێتە خوار، پێش ئەو و دوای ئەو هیچ هاوشێوەیەكی ئەوم نەدیوە. چاوەكانی زۆر گەورە و ڕەش بوون، موی قژی ساف و بۆ خوارەوە بوو و كوڵمەكانی گۆشتن نەبوون بەلاَم تاڵی مووز بەشێوەیەك هاتبوونەدەر لەنەرمەی گوێچكەیەوە، دەتوت گەردنی دەفرێكی سیمینە، كاتێك ڕووی لەكەسێك دەكرد هەموو جەستەی خۆی دەسوراند، دڵۆپەكانی عارەق لەسەر قەراغەكانی روخساری لەمروارید دەچوون و بۆنی گوڵیان دەپرژاند.

لەناو هەردووشانی مۆری پێغەمبەری دەبینرا و ئەمە لەتە گۆشتێکی زیادە بوو کەدەوروبەری قژی گرتبوو.

ناوەکانی بەوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) وتویەتی بەمشێوەیە: من محەممەد(وەسف کراو)، ئەحمەد( ئەو کەسەی خوا وەسفی دەکات) موقەفی (نمونەیەك بۆ شوێنکەوتن)، حاشر(بزوێنەر)، پەیامهێنەری خۆشەویستی، پێغەمبەری گەڕانەوە بۆ لای خوا، پێغەمبەری شەڕکەر، عاقب (کۆتایی پێغەمبەران) و ماحی (کە خوا بەمن ناباوەڕی دەسڕێتەوە)م.

بەڵام مووی ئەو و سپیەتییەکەی، ئونس دەڵێت: خوا هیچ کات مووی ئەوی سپی نەکرد. لەپێشەوەی ڕیشی بیست تاڵ مووی سپی بوو کەرەنگی نەدەکرد. جابر کوڕی سەمورە دەڵێت: لەناو سەری چەند تاڵێکی سپی تیابووو کاتێك بەڕۆن چەوری دەکرد، دیارنەدەما. دایکی سەلمە سەری ئەوی بەوسمە و خەنە ڕەنگ دەکرد. ئەبو ڕەمسە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) مووی خۆی ڕەنگ دەکرد و قژ درێژی تا سەرشانی دەگەشت. دایکی هانی دەڵێت: ئەو چوار پرچی هەبوو.

## بوێری و بەخشندەیی پێغەمبەر( د.خ )

ئونس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بوێرترین و بەخشندەترین و باشترینی خەڵکان بوو. جارێك ئاژاوەیەك لەمەدینە دروست بوو، پێغەمبەر(د.خ) سوار ئەسپێکی زین نەکراو پێش هەمووان خۆی گەیاندە ئەوێ و وتی: ئەی خەڵکینە، ڕێزتان نەگرت، ڕێزتان نەگرت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: هەرکات لەشەڕەکان بارودۆخ لەسەرمان دژوار دەبوو، پەنامان بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەبرد و ئەو لەهەمووان زیاتر لەدوژمنەوە نزیك بوو. ئەم شایەتییە بۆ بوێری ئەو بەسە کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بەو هەموو ئازایەتییەوە سەبارەت بەو بیهێنێتە سەر زمان. سەبارەت بەشەڕەکانی چەندین داستان وترا کەبەڵگەن بۆ بوێری و ئازایەتی بێ سنوری ئەو بەشێوەیەك ناتوانین کەس بەهاوتای ئەو بزانین.

## ژمارەی ژن و کەنیزەکانی پێغەمبەر( د.خ )

کوڕی کەلبی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پانزە ژنی وەك هاوسەر هەڵبژارد و لەگەڵ سیانزەی ئەواندا خەوت و لەیەك کاتدا یانزە ژنی هەبوو و کاتێك مرد نۆیان هاوسەری بوون. یەکەم ژن کەوەك هاوسەر هەڵیبژارد، خەدیجە کچی خویلد بوو. ئەم خاتونە پێش پێغەمبەر(د.خ) ژنی عەتیق کوڕی عایز کوڕی عەبدوڵلە کوڕی مەخزوم بوو کەمرد و دواتر ئەبوهالە کوڕی زورارە کوڕی نەباشی تەمیمی ئەوی کردە هاوسەری خۆی کەهەند کوڕی ئەبی هالەی بۆ هێنایە دنیا. کاتێك ئەبوهالە مرد و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە هاوسەری خۆی، هەشت منالی بۆ هێنایە دنیا: قاسم، تەییب، تاهیر، عەبدوڵلە، زێنەب، ڕوقیە، دایکی کولسوم و فاتیمە. کوڕەکان لەمناڵیدا مردن و کچەکان گەورە بوون و شوویانکرد و مناڵیان هێنایەدنیا (لەناو ئەوانیش تەنیا مناڵەکانی فاتیمە بەزیندوویی مانەوە). پێغەمبەر(د.خ) لەژیانی خەدیجە هیچ ژنێکیتری نەکردە هاوسەری خۆی. خەدیجە سێ ساڵ پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆمەدینە (دەوروبەری ٦١٨ زایینی) کۆچی دوایی کرد. ئەو لەهیچ کام لەژنەکانیتری جگە لەخەدیجە منالی نەبوو جگە لەماریەی جوان ڕوخسار کەئیبراهیمی هێنایە دنیا.

کاتێك خەدیجە مرد، دوای ئەو سودە کچی زەمعەی کردە هاوسەری خۆی. دەستەیەك دەڵێن: عایشەی هەڵبژارد. کاتێك عایشە بوو بەهاوسەری، کچێکی ورد و شەش ساڵە بوو. سودە بێوەژن و پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری سەکران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەبدشەمس برای سوهەیل کوڕی عەمرۆ بوو کەباوەڕی هێنا و بۆ حەبەشە کۆچی کرد بەلام لەوێ باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا و لەسەر ئەم ئایینە چاوی لەدنیا بەست. دواتر پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە بوو بەهاوسەری. ئەوەی ئەم ژنەی بۆ خوازبێنی کرد و مارەیی لەسەر دانا، خەولە کچی حەکیم هاوسەری عوسمان کوڕی مەزعون بوو. ئەو لەمەککە لەگەڵ سودە خەوت. ئەم ژنە باوکی زەمعە کوڕی قەیس کردی بەهاوسەری پێغەمبەر(د.خ). کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەم

ژنەی کردە هاوسەری خۆی، براکەی عەبد کوڕی زەمەعە لەدەرەوەی شار بوو و کاتێك گەڕایەوە، خۆڵی دەکرد بەسەری خۆیدا. کاتێك باوەڕی هێنا، وتی: من کەسێکی نەزان بووم کەکارێکی بەوشێوە ناڕەوام کرد. ئەو لەکرداری خۆی پەشیمان بوویەوە.

بەڵام عایشە پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینە لەگەڵی خەوت و کچەکە لەم کاتەدا نۆ ساڵ تەمەنی بوو. پێغەمبەر(د.خ) لەتەمەنی هەژدە ساڵی بەجێی هێشت و چاوی لەدنیا بەست. ئەو جگە لەعایشە هیچ کچێکیتری نەکردە هاوسەری خۆی. عایشە لەساڵی پەنجاوهەشت/٦٧٨ زایینی کۆچی دوایی کرد. دوای ئەو حەفسە کچی عومەر کوڕی خەتابی کردە هاوسەری خۆی. ئەو پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری خونەیس کوڕی حوزافەی سەهمی بوو کەلەشەڕکەرانی بەدر هەژمار دەکرا. لەمناڵەکانی سەهم جگە لەو کەس لەم شەڕەدا ئامادە نەبوو. حەفسە لەپێغەمبەر(د.خ) مناڵی نەبوو. ئەو لەرۆژگاری خەلافەتی عوسمان لەمەدینە کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەو دایکی سەلمە کچی ئەبی ئومەییە زادئەلراکیبی کردە هاوسەری خۆی. ئەم ژنە پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری ئەبی سەلمە کوڕی عەبدوئەلئەسەدی مەخزومی بوو. ئەبی سەلمە لەشەڕی بەدر ئامادە و لەشەڕی ئۆحوّد بریندار و لەو زیانەکەی مرد. پێغەمبەر(د.خ) پێش شەڕی ئەحزاب ئەوی کرەهاوسەری خۆی. ئەو لەساڵی پەنجاو نۆ/ ٦٧٩ زایینی مرد. دەستەیەك دەڵێن: دوای کوژرانی حسێن کوڕی عەلی مرد.

دواترلە گەڵ زێنەب کچی خوزەیمە لەمناڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە پەیوەندی هاوسەر گیری بەست. ئەم ژنەیان بەدایکی هەژاران ناودەبرد. زێنەب لەژیانی پێغەمبەردا مرد. جگە لەم ژنە و خەدیجە کچی خویلد، هیچ هاوسەرێکیتری پێغەمبەر(د.خ) لەژیانی خۆیدا نەمرد. ئەو پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری توفەیل کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب بوو.

دواتر لەساڵی مورەیسیع جویرییە کچی حارس کوڕی ئەبی زەراری خوزاعی لەمناڵەکانی موستەلیقی کردە هاوسەری خۆی. پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری سەفوانی موستەلیقی بوو. ئەم ژنە مناڵی نەبوو.

دواتر دایکی حەبیبە کچی ئەبوسوفیان کوڕی حەربی کردە هاوسەری خۆی. ئەو پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری عوبەیدالله کوڕی جەحش لەکۆچکەران بۆ حەبەشە بوو کەلەوێ لەدینی ئیسلام هەڵگەرایەوە و باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا و لەوێش مرد. پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ لای نەجاشی نارد و خوازبێنی لێکرد وئەوی لەحەبەشە کردە هاوسەری خۆی. خالید کوڕی سەعید کوڕی ئەلعاس پەیوەندی هاوسەرگیری بۆ پێغەمبەر(د.خ) بەست. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نییە، بەڵکو ئەوی لەعوسمان کوڕی عەففان خوازبێنی کرد وبۆ هێنانی ئەو کەسی ناردە لای نەجاشی ومارەیی ژنەکە کەبریتی بوو لەچوارسەد دینار، بۆی نارد و نەجاشی ئەوی رەوانەی لای پێغەمبەر(د.خ) کرد. ئەو لەخەلافەتی براکەی معاویە کۆچی دوایی کرد. دایکی حەبیبە هیچ مناڵێکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نەهێنایە دنیا.

دواتر لەگەڵ زێنەب کچی جەحش پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەو پێش پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری زەید کوڕی حارسە کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) بوو. زێنەب مناڵی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نەهێنا. خوا ئەوی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) و بۆ ئەم کارە جبرەئیلی ڕەوانە کرد. زێنەب لەم ڕێگاوە شانازی بەسەر ژنانیتردا دەکرد و دەیوت: من بەرێزترینی ئێوە لەنیگای سەرپەرەست و پەیکی خوازبێنیم (کەسەرپەرەستەکەم خوا بوو و خوازبێنیکەرەکەم جبرەئیل). ئەو یەکەم هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) بوو کەمرد چوونکە لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب دنیایی بەجێهێشت.

دواتر لەساڵی خەیبەر (ئەو ساڵەی شەڕی خەیبەر تیایدا ڕوویدا) سەفیە کچی حەیی کوڕی ئەختەبی کردە هاوسەری خۆی کەپێش ئەو هاوسەری سەلام کوڕی مشکەم بوو و دواتر هاوسەری کەنانە کوڕی ڕەبیع کوڕی ئەبی حوقەیق. ئەم کەنانە بەدەستی محەممەد کوڕی موسلیمە بەئەشکەنجە کوژرا. دواتر پێغەمبەر(د.خ) (کە ئەو بەکۆیلەی دادەنرا) ئەوی ئازاد کرد. ئەوی لەساڵی شەشەم / ٦٢٧ زایینی کردە هاوسەری خۆی. ئەم ژنە لەساڵی سی و شەشەم /٦٥٧ زایینی کۆچی دوایی کرد.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ مەیمونەی حارسی کچی حارس پەیوەندی هاوسەری بەست کەپێشتر ژنی عومەیر کوڕی عەمرۆی سەقەفی بوو و مناڵی

لەپێغەمبەر(د.خ) نەبوو. مێردەکەی دوای عومەیر، باوکی زوهەیر کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی عومەیر و دواتر پێغەمبەر(د.خ) بوو. ئەو بەپوری عەبدوللە کوڕی عەباس و خالید کوڕی وەلید لەقەڵەم دەدرا. پێغەمبەر(د.خ) لەعەمرەی قەزا بەسەریف ئەوی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد.

دواتر نشە ژنێك لەمناڵەکانی کەلاب (کچی رفاعە)ی کردە هاوسەری خۆی. دەستەیەك دەڵێن: ناوی ئەو شنبا کچی ئەسمە کوڕی سڵت بوو و دەستەیەك دەڵێن: کچی سڵت کوڕی حەبیب. ئەم ژنە پێش ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بخەوێت، مرد.

دواتر لەگەڵ شنبای غیفاری یا کەنانی پەیوەندی هاوسەری بەست. پێش ئەوەی بڕواتە لای ئەو، ئیبراهیم کوڕی پێغەمبەر(د.خ) مرد. ژن وتی: ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) بوایە، کوڕەکەی نەدەمرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ئازاد کرد.

دواتر عەربەی کەلابی کچی جابری کەلابی کردە هاوسەری خۆی کەئەبو ئۆسیدی ساعدی خوازبێنی بۆ کرد. کاتێك هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) ویستی لەگەڵی بخەوێت، نازی کرد و وتی: پەنا بەرخوا، پێغەمبەر(د.خ) و ئەم کارانە! پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ناردەوە.

یەکێکیتر لەهاوسەرەکانی زەبیان بوو کەلەگەڵی کۆبوویەوە و دواتر وازی لێ هێنا.

هەروەها قوتیلە کچی قەیس خوشکی ئەشعەس کەپێغەمبەر(د.خ) پێش ڕۆشتنە لای ئەو کۆچی دوایی کرد و ژن لەئیسلام هەڵگەرایەوە.

هەروەها فاتیمە کچی سەرع.

کوڕی کەلبی دەڵێت: عەربە هەمان دایکی شەریك بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەو خولە کچی هوزەیل کوڕی هوبەیرە و لەیلای ئەنساری کچی خەتیمی کردە هاوسەری خۆی. ئەم ژنە پێشنیاری هاوسەری بەپێغەمبەردا و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە هاوسەری خۆی. ژن کەسەکانی خۆی ئاگادار کردەوە و ئەوان وتیان: تۆ ژنێکی بەرچاوتەسکیت و ئەو ژنی زۆری هەیە. ژن پەیوەندییەکەی خۆی پچراند

و پێغەمبەر(د.خ) لێی جیابوویەوە.

بەڵام ئەو ژنانەی پێغەمبەر(د.خ) خوازبێنی لێکردن بەڵام نەیکردن بەهاوسەری خۆی، بریتی بوون لە: دایکی هانی کچی ئەبوتالیب کەخوازبێنی لێکرد بەڵام نەیکردە هاوسەری خۆی، ساعە کچی عومەر لەمناڵەکانی قوشیر، سەفیە کچی بەشامە خوشکی ئەعوەری عەنبەری، دایکی حەبیبە کچی مامەکەی عەباس کەعەباسی بەبرای شیری ئەو بینی ولێی جیابوویەوە.جومەر کچی حارس کوڕی ئەبی حارسە کەخوازبێنی لێکرد و باوکی وتی: ئەو جۆرە نەخۆشییکەی هەیە (درۆی دەکرد) و کاتێك ڕۆشتە لای کچەکەی بینی، نەخۆشی گولی گرتووە.

ئەو کەنیزانەی بوون بەهاوسەری، یەکیان ماریەی جوان روخساری قبتی کچی شەمعون کەئیبراهیمی بۆ هێنایە دنیا ویەکیان ڕێحانە قورەزی کچی زەید. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەمناڵەکانی نەزیر بوو.

## کۆیلەکانی پێغەمبەر(د.خ)

یەکیان زەید کوڕی حارسە، کوڕی ئوسامە و سەوبان بەنازناوی باوکی عەبدوڵڵە کەزادگاکەی سراە و دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەحەمس نیشتەجێ بوو و لەساڵی پەنجا و حەوت / ٦٧٧ زایینی مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەرمەلە نیشتەجێ بوو. ئەو مناڵی نەبوو.

هەروەها شوقران لەحەبەشە یا ئێران کە بەساڵح کوڕی عودەی ناویان بردووە. سەبارەت بەچارەنوسی ئەو لەناو زاناکاندا جیاوازی هەیە. دەستەیەك دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەمیرات لەباوکییەوە بۆ مایەوە. دەستەیەك دەڵێن: کۆیلەی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بوو بەپێغەمبەری بەخشی. ئەویش مناڵی نەبوو.

ئیبراهیم یا ئوەیقێع بەنازناوی باوکی عەبدوڵڵە. کۆیلەی عەباس مامی پێغەمبەر(د.خ) بوو کەبەپێغەمبەری بەخشی و پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد. دەستەیەك دەڵێن: کۆیلەی ئۆحەیحە کوڕی سەعید کوڕی عاس بوو کە سیان لەکوڕەکانی، بەشی خۆیان لەو ئازاد کرد. ئەو لەشەڕی بەدر ئامادە بوو و ئەم دەستەیە ناباوەڕ بوون و لەم ڕۆژەدا کوژران. خالید کوڕی سەعید بەشی خۆی لەو

بەپێغەمبەر(د.خ) بەخشی و پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد. و کوڕەکەی (بوهی) بەناوی باوکی رافیع و براکەی عوبەیداللە کوڕی ئەبی رافیع بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاری دەبیری دەکرد.

باوکی عەبدوللە سەلمانی پاکی فارسی لەخەڵکی ئیسفەهان یا رامهورموز. دەستەیەك لەخەڵكانی کەلب ئەویان بەئەسیری گرت و کردیان بەکۆیلەی خۆیان و لەوادی ئەلقورا بەجوولەکەیەکیان فرۆشت. سەلمانی فارسی سەبارەت بەئازادی خۆی لەگەڵ ئەو جوولەکە پەیمانی بەست و نامەی نووسی و پێغەمبەر(د.خ) یارمەتیدا تا ئازادی خۆی بەدەست هێنا.

و سیفەینە کەکۆیلەی دایکی سەلمە بوو. ئەم ژنە لەسەر ئەو بنەمایە ئازادی کرد کەلەهەموو ژیانیدا خزمەتی پێغەمبەر(د.خ) بکات. ناوی میهران یا رەباح بوو. دەستەیەك دەڵێن: بەرەچەڵەك ئێرانی بوو.

باوکی مەسروح ئەنسە لەمناڵەکانی سراه کە بۆ پێغەمبەر(د.خ) چاوەشی دەکرد. لەشەڕەکانی بەدر و ئوحود و هەموو شەڕەکانیتر ئامادە بوو. ئەویشیان بەرەچەڵەك بەئێرانی زانیوە.

باوکی کەبشە سولەیم. دەڵێن: کۆیلەیەك بوو لەکۆیلەکانی مەککە. دەستەیەك دەڵێن: خەڵکی سەرزەمینی دوس بوو کەپێغەمبەر(د.خ) کڕی و ئازادیکرد. ئەو لەشەڕی بەدر و هەموو شەڕەکانیتر ئامادە بوو. لەساڵی سیانزە /٦٣٤ زایینی، رۆژێك کەعومەر کوڕی خەتاب هاتە سەرکار، مرد.

باوکی مویهیبە رویقێع کەخەڵکی موزەینە بوو و پێغەمبەر(د.خ) کڕی و ئازادیکرد.

رەباح کوڕی ئەسوەد کەچاوەشی بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەکرد.

و فەزالە کەلەشام نیشتەجێ بوو.

میدغەم کە لەوادی ئەلقورا کوژرا.

باوکی زومەیەر. دەڵێن: لەجوامێرە ئێرانییەکان و لەنەژادی شای شاکان بشتاسب هەژمار دەکرا و پێغەمبەر(د.خ) لەیەکێك لەشەڕەکان بەئەسیری گرتی و دواتر ئازادیکرد. ئەو باوەگەورەی باوکی حسێن بوو.

یەسار کەخەڵکی نۆبە و پێغەمبەر(د.خ) لەیەکێك لەشەڕەکان گرتی و دواتر ئازادیکرد. ئەوبوو بەدەستی عورنیون کوژرا و ئەمانە ئەو کەسانە بوون هێرشیانکردە سەر مەروماڵاتی پێغەمبەر(د.خ) و تالآنیان کرد.

مهران کەحەدیسی لەپێغەمبەر(د.خ) گێراوەتەوە. هەروەها ئەو کۆیلەیەکەی خەساوی هەبوو کەپێیان دەوت مابووز و مەقوقس ئەوی لەگەڵ شیرین و ماریەی جوان روخسار پێشکەش کرد. پێغەمبەر(د.خ) عەلی نارد تابیکوژێت. عەلی بینی پیاوێکی خەساوە و بەرەلآی کرد.

هەروەها لەو کاتەی سوپاکەی تایفیان گەمارۆدابوو، چوار کۆیلە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئازادیکردن. یەکێك لەوان ئەبوبەکرە بوو.

## دەبیرەکانی پێغەمبەر(د.خ)

دەڵێن: هەندێ کات عوسمان کوڕی عەففان شتی بۆ دەنووسی و هەندێ کات عەلی کوڕی ئەبی تالیب. هەروەها خالید کوڕی سەعید و عەلا کوڕی حەزرەمی دەبیریان بۆ دەکرد. یەکەم کەس کەکاری دەبیری بۆکرد ئۆبەی کوڕی کەعب بوو. زەید کوڕی سابتیش ئەو کارەی بۆ دەکرد. هەروەها عەبدوڵڵە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی ئەسرەح شتی بۆ دەنووسی. ئەو لەدین هەڵگەڕایەوە و دواتر لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنایەوە. معاویە کوڕی ئەبوسوفیانیش ئەم کارەی بۆ دەکرد. هەروەها حەنزەلەی ئەسیدیش.

## ناوی ئەسپەکانی پێغەمبەر(د.خ)

دەڵێن: یەکەم ئەسپ کەپێغەمبەر(د.خ) بوو بەخاوەنی، ئەو ئەسپە بوو کە بەبەهای دە وەقیە لەعەرەبێکی فەزارەی کڕی و ناوینا سەکب. یەکەم شەڕ کەسوار ئەو ئەسپە بوو، ئۆحۆد بوو. ئەسپێکیتری مولاویح بوو کەپێشتر لەناو تەویلەی باوکی بەردە کوڕی نیار بەسەری دەبرد. ئەسپێکیتری هەبوو بەناوی موتەجیز کەسواری بوو و ڕووبەڕووی خوزەیمە کوڕی سابت بوویەوە. خاوەنی ئەم ئەسپە لەمناڵەکانی مورە بوو.

سێ ئەسپیتری هەبوو بەناوی: لیزاز، زەرب و لەحیف. لیزاز، مەقوقس پێشکەشی کرد. زەرب فەروە کوڕی عومەری جەزامی و لەحیف ڕەبیعە کوڕی ئەبی بەرا . ئەسپێکیتری ناوی (ورد) بوو کەتەمیم داری پێشکەشی پێغەمبەری کرد و ئەویش بەعومەر کوڕی خەتابی بەخشی. عومەر لەرێگای خوا سواری بوو و دواتر بینی بۆ فرۆش دانراوە. ئەسپەکەیتری ناوی (یەعسوب) بوو.

مانای ناوەکان:

سەکب بەمانای ئەوەی زور هەڵبەز و دابەز دەکات بەشێوەیەك وەك بڵێی هەڵبەز و دابەزی لێدەبارێت.

لەحیفیان بۆیە بەم ناوە بانگ دەکرد چوونکە کلکێکی درێژی بوو وەك بڵێی لەسەر زەوی ڕاخەری ڕادەخست چوونکە زەوی دادەپۆشی.

لێزازیان بۆیە بەم ناوە بانگ دەکرد چوونکە بەخێرایی بۆ ڕاست و چەپ دەسوڕا یا زۆر پڕجوڵە بوو.

زەربیان لەبەر بەهێزی و گەورەی پەیکەری بەم ناوە بانگکردووە یانی بەچیایەکی بچوکیان زانیوە.

مورتەجیزیان بۆیە بەم ناوە بانگ کردووە چوونکە دەنگی لەکاتی حیلاندندا خۆش بووە.

یەعسوبیان لەبەر ئەوە ناونا چوونکە باشترینی ئەسپەکانی بوو چوونکە یەعسوب بەمانای سەروەر دێت.

## ئێستر و كەر و وشترەكانی پێغەمبەر(د.خ)

ئەو ئێسترێكی هەبوو بەناوی دوڵدوڵ و ئەمە یەكەم ئێستر بوو لەناو موسوڵمانان بینرا. مەقوقس لەگەڵ كەرێك بەناوی عوفەیر بۆ پێغەمبەری نارد. ئەم ئێسترە تا رۆژگاری معاویە مایەوە. فەروە كوڕی عەمرۆ ئێسترێكی بەناوی فزە پێبەخشی و ئەو دای بەئەبوبەكر. كەرەكەی یەعفور دوای حەجیماڵئاوایی تۆپی.

لەوشترەكانی ئەو یەكیان قەسوء كەبە چوارسەد درەم لەئەبوبەكری كڕی و لەمەككەوە بۆ مەدینە كۆچی پێكرد. ئەمە یەكێك لەچوارپێكانی منداڵەكانی حورەیش بوو و بۆ رۆژگارێك مایەوە. بە عەزبء و جەدعایش ناویان بردووە. كوڕی موسەیب دەڵێت: شوێنی براوییەك بەگوێچكەیەوە دەبینرا. دەستەیەك دەڵێن: نەیبوو.

ئەو بیست وشتری بوو كەلەدارستان دەلەوەڕین و شیری زۆریان تیابوو. ئەم وشترانە دەستەیەك لەبیابانگەڕەكان تالآنیان كرد. پڕشیرترین وشترەكانی ئەمانە بوون: حەسنة ، سەمرة ، عەریس، سەعدیە، بەغوم، یەسیرە، ڕیا، موهرە و شەقرء .

مەڕە شیردەرەكانی حەوت سەر بوون: عەجوە، زمزم، سوقیا، بەرەكە، وەرەسە، ئیتلال و ئەتراف. ئەو حەوت بزنی بوو كەئەیمەن كوڕی دایكی ئەیمەن دەیلەوەراندنت.

### مانای ناوەكان:

عوفەیر كورتكراوەی(ئەعفەرە) وچوارپێیەكی سپیە كەسپیەتییەكەی تەواو نەبێت. كەرەكەیشی بەهەمان شێوە لەم ناوەوە ناوی پێبراوە وەك ئەخزەر و یەخزور.

بەغام بەمانای دەنگی وشترە و بەغومیش لەم ڕەگەیە. ناوەكانیتر پێویستان بەڕوونكردنەوەی ماناكانیان نییە.

## کەلوپەلەکانی شەڕی پێغەمبەر(د.خ)

یەکێك لەشمشێرەکانی زولفەقار بوو کەلەرۆژی بەدر لەمونبە کوڕی حەجاجی بەتالانی گرت. دەستەیەك دەڵێن: هی کەسێکیتر بوو. لەماڵەکانی قینقاع سێ شمشێری بەتالانی گرت: شمشێرێکی رویین، شمشێرێکیتر بەناوی بەتار (بەمانای زۆر تیژ و بڕەر) وسێیەم بەناوی (خیف) یانی مەرگ ئافرێن. هەروەها دوو شمشێری بەناوەکانی مێخدەم و رەسوب هەبوو. کاتێك هاتە مەدینە دوو شمشێری لەگەڵ خۆی هێنا کەیەکیان پێیان دەوت (عەزب) و بەو شمشێرە لەشەڕی بەدر بەشداری کرد. ئەو سێ کەوان وسێ زرێی هەبوو. کەوانەکانی بەناوی (بەیزا ) سپی، رەوحا و ئەویتریان لەداری نەبع کەپێیان دەوت سەفرا (زەرد).ئەو زرێیەکی هەبوو پێیان دەوت سەعدییە و زرێیەك بەناوی فزە کە لەماڵەکانی قینقاعی بەتالانی گرتبوو. زرێیەکیتر کە بە(اذت الفضول) ناو دەبرا و ئەوەیە لەشەڕی ئۆحۆد لەبەری کرد. ئەم زرێیە سیمین بوو. قەڵغانێکی هەیە کەسەری بەرخێکیان لەسەر هەڵکەندبوو و پێغەمبەر(د.خ) پێی ناخۆش بوو. بۆ رۆژی دواتر بینی خوا ئەو نیگارەی سڕیوەتەوە.

**مانای ناوەکان:**

زولەفەقاریان بۆیە بەم ناوە ناو بردوە چوونکە چەندین درز و کەلێنی تیابووە.

میخدەم بەمانای تیژ و بڕەرە.

رەسوب ئەوەیە لێدانەکەی کاریگەرە و لەشوێنی لێدان دەچەقێت و تا قولایی دەیقڵشێت.

## ڕووداوەکانی ساڵی یانزەهەمی کۆچی ( ٦٣٢ زایینی )

لەموحەرەمی ئەم ساڵە / ئاوریلی ٦٣٢ زایینی پێغەمبەر(د.خ) لەشکرێکی بەفەرماندەیی کۆیلەکەی، ئوسامە کوڕی زەید ڕەوانەی شام کرد و فەرمانی پێدا ئەسپەکانی خۆیان تا سنورەکانی بەلقە و داروم لەپانتاییەکانی فەلەستین غاربدەن. دووڕووەکان لەمبارەوە گفتوگۆیان کرد و وتیان: کوڕێکی تازەپێگەیشتووی کردە فەرمانڕەوای موهاجیر و ئەنسار. پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەگەر فەرمانڕەوایی ئەو بەناڕەوا بزانن، ترسم نییە چوونکە پێشتریش فەرماندەیی باوکیتان بەناڕەوا زانی، بەڵام ئەو شیاوە بۆ فەرماندەیی بەهەمان شێوە کەباوکی شیاو بوو. ئەو یەکەم دەستەی موهاجیرەکانی لەگەڵ ئوسامە ڕەوانە کرد کەئەبوبەکر و عومەر لەناویاندا بوون. خەڵك ئەم سوپایەیان کۆدەکردەوە کەلەناکاو پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد.

## نەخۆشی و مردنی پێغەمبەر( د.خ )

سەرەتایی دەسپێکردنی نەخۆشی پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی سەفەر / سەرەتاکانی مانگی مەی ٦٣٢ زایینی لەماڵی زێنەب کچی جەحش بوو. ئەو لەناو ژنەکانی خۆی دەگەڕا تا ئەوەی لەماڵی مەیمونە نەخۆشییەکەی قورس بوو. لەبەر ئەمە ژنەکانی خۆی کۆکردەوە و داوای لێکردن تا لەماڵی عایشە پەرەستاری لێبکرێت. لەم کاتەدا هەواڵی ناخۆش سەبارەت بەدەرکەوتنی ئەسوەدی عەنسی لەیەمەن، موسەیلەمە لەیەمامە، تولەیحە لەمناڵەکانی ئەسەد و عەسکەر لەسومەیرە بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت. بەپشت بەستن بەخوای گەورە لەشوێنی خۆیاندا ئاماژەیان پێدەدەین.

ئوسامە کەڕووبەڕووی نەخۆشی لەناکاوی پێغەمبەر(د.خ) بوویەوە و لەلایەکیتر هەواڵی دەرکەوتنی ئەسوەد عەنسی و موسەیلمەی بیست، نەڕۆشت. پێغەمبەر(د.خ) بەسەرێکی بەستراو لەتاو ئازار هاتەدەر و وتی: بەهەمان شێوە

کەبینەرێك لەخەودا دەبینێت، بینیم دوو دەسبەندی زێرینم لەدەستایە کەئەوانم کردەوە و هەردووکیان هەڵفڕین. من ئەم خەوە بەمشێوە لێکدەدەمەوە کەدرۆزنەکەی یەمامە و درۆزنەکەی سەنعا لەناو دەچن. ئەو فەرمانیدا سوپاکەی ئوسامە ڕەوانە بکەن. وتی: نفرینی خوا لەو کەسانە بێت ئارامگای پێغەمبەرانیان کردە شوێنی پەرەسگا.

ئوسامە ڕۆشت و لە(جورف) خێوەتی هەڵدا. خەڵك درەنگیان کرد و پێغەمبەر(د.خ) زیاتر نەخۆش. قورس بوونی نەخۆشییەکەی ڕێگەی لێنەگرت لەئەنجامدانی فەرمانی خوایی. دەستەیەکی بۆ لای ئەنسار نارد و داوای لێکردن زیانی ئەسوەد لەناو ببەن. ئەسوەد لەژیانی پێغەمبەر(د.خ) دوو ڕۆژ پێش مردنی، لەناوچوو. ئەو پەیك و پەیامی بۆ لای دەستەیەك لەخەڵکان نارد و داوای لێکردن شەڕ لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن کەلەدین هەڵگەڕاونەتەوە.

باوکی مویهبە کۆیلەی پێغەمبەری خوا دەڵێت: جارێك شەو پێغەمبەری خوا منی لەخەو هەڵساند و وتی فەرمانیان پێداوم بۆ بەخاك سپێردراوانی بەقیع داوای لێخۆشبوون بکەم، لەگەڵ من بەرێکەوە. لەگەڵ ئەو ڕۆشتم سڵاوی بۆ ناردن و وتی: ئەو شوێنەی لەوێدان، جێگەیەکی خۆش بێت بۆ ئێوە. ئێستا ئاژاوەکان هاوشێوەی لافاوەکانی شەوێکی ڕەش هێرش دەبەن. وتی: کلیلی گەنج خانەکانی سەر زەوییان بەمن بەخشی کەتیایدا ببمە هەمیشەیی یا بەرەو بەهەشت بڕۆم. سەرپشکیان کردم تا یەکیان هەڵبژێرم یا بڕۆمە لای خواوەند. بینینی خوام هەڵبژارد. دواتر بۆ بەخاك سپێردراوانی بەقیع داوای لێخۆشبوونی کرد و بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. نەخۆشیەکەی لەم کاتەدا دەستی پێکرد.

عایشە دەڵێت: کاتێك لەبەقیع گەڕایەوە، منی بینی لەژانەسەر هاوار دەکەم و بەردەوام دەڵێم، ئاخ سەرم! پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی عایشە، شیاوە من هاوار بکەم و بڵێم، ئای سەرەم! فەرمووی: چی دەبوو ئەی عایشە ئەگەر تۆ دەمردی و من کارووبارەکانی تۆم دەکرد و کفنم دەکردی و نوێژم لەسەر دەخوێندی و بەخاك دەسپاردی؟ وتم: سوێند بەخوا بەوشێوە دەبینم ئەگەر ئەم کارە بکەیت، هەمان سات دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ و دەچیتە ئامێزی یەکێك لەژنەکانت. ئەو بزەیەکی گرت.

لێرەدا نەخۆشییەکەی زیادی کرد و لەماڵەکەی مندا کەوت.

رۆژێك لەکاتێکدا دوو پیاو ژێر باڵیان گرتبوو، هاتەدەر. ئەوان فەزل کوڕی عەباس و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون. فەزل دەڵێت: ئەوم هێنایەدەر تا لەسەر تەختی وتاردانی خۆی لەمینبەر دانیشت و سوپاس و ستایشی خوای کرد. یەکەم قسە کەهێنایە سەرزمان ئەوە بوو، سڵاوی زۆری لە کوژراوانی ئوحود کرد و داوای لێخۆشبوونی لەخوا بۆ کردن. وتی: ئەی خەڵکینە کاتی ئەوە هاتووە، مافەکانی خۆتان لەمن وەربگرنەوە، قامچییەم لەپشتی هەر کەسێك داوە، ئێستا پشتم لەبەردەستیایەتی، بابێت و بەقامچی لەپشتم بدات. سامانی هەر کەسێکم گرتووە، با بێت و لێم بسێنێتەوە و لەرق و کینەی من نەترسێت چوونکە لەمن ناوەشێتەوە. خۆشەویستترین کەسی ئێوەە لای من ئەوەیە بێت و مافەکانی خۆی لەمن وەربگرێتەوە یا بەمنی ببەخشێت تا بەگیانێکی پاك و ئارام و خاوێن بڕۆمە دیداری خواوەند. ئەوسا هاتە خوار و نوێژی نیوەڕۆی خوێند و دووبارە لەسەر تەختی وتاردان دانیشت و وتاری یەکەمی خۆی دووبارە هێنایە سەر زمان. پیاوێك هەستا و وتی: سێ درەمی من قەرزاریت. پێغەمبەر(د.خ) بۆی گەڕاندەوە. دواتر وتی: ئەی خەڵکینە هەرکەس شتی کەسێکی لایە، بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە و نەڵێت لەم جیهانەدا ڕیسوا دەبم. بزانن ڕیسوایی ئەم جیهانە لەڕیسوایی ئەو جیهانە سووکترە. دواتر دووبارە سڵاو و درودی بۆ کوژراوانی ئوحود نارد و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن. وتی: ئێستا لێرە بەندەیەك لەبەندەکانی خوایە کەخوا ئەوی لەناو مانەوە لەم جیهانە و ڕۆشتن بۆ لای خواوەند و کەڵکوەرگرتن لەو شتانەی لای ئەوە، سەرپشك کردووە. ئەو، لای خوای هەڵبژاردووە. ئەبوبەکر گریا و وتی: قوربانی تۆ بێت، گیانی ئێمە، قوربانی تۆ بن باوکانی ئێمە! پێغەمبەر(د.خ) وتی: بێ گومان هیچ دەرگایەك بەرەو مزگەوت کراوە نابێت مەگەر دەرگای ماڵی ئەبوبەکر، چوونکە من لەناو هاوڕێیانی خۆم کەس لەو بەباشتر نازانم. ئەگەر بڕیار بوایە، هاوڕێم هەڵبژاردایە، ئەبوبەکرم هەڵدەبژارد بەڵام بنەمای کاری من لەسەر برایەتی ئیسلامیە. ئەوسا موهاجیرەکانی راسپارد ڕێزی ئەنسار بگرن. وتی: ئەی موهاجیرەکان، ئێوە زیاد بوون و ئەنسار کەمیان کردووە، ئەنسار هاوڕێیان و پشت

و پـەنای مـنن، کـە ڕوومکـردە ئـەوان. ڕێـز لـەڕێزدارەکانی ئـەوان بگـرن و لەخراپەکارانیان خۆش بن.

عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) و هاوڕێی ئێمە، مانگێك پێش مردن، لەمەرگی خۆی ئاگاداری کردینەوە. کاتێك، کاتی جیابوونەوە هات، ئێمەی لەماڵی عایشە کۆکردەوە و سەیری ئێمەی کرد و ڕوانینەکەی خایاندی و لەقوڵایی ڕوخساری ئێمە ڕۆچوو و چاوە ڕووناکبینەکانی فرمێسکی باران ئاسایان باراند. وتی: ئافەرین بۆ ئێوە، سلاوی خوا لەئێوە، خوا لێتان خۆش بێت، خوا پەناتان بدات، خوا بتان پارێزێت، خوا لەپێشیتان پێ ببەخشێت، خوا بەختەوەرتان بکات، خوا لێتان رازی بێت و خوا تەندروستیتان پێ ببەخشێت. پێشنیارتان پێدەکەم لەبەرابەر خوا، خۆپارێز بن و لەخوا داوا دەکەم هاوکاریتان بکات. خوا دەکەمە جێگری خۆم لەسەر ئێوە و ئێوە بەو دەسپێرم. من بۆ ئێوە مژدەدەر و پەیامبەرم. لەناو بەندەکان و سەرزەمینی خوا یاخیگەری مەکەن چوونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ئەو دنیا تایبەت دەکەم بەو کەسانەی نایانەوێت لەسەر زەوی یاخیگەری بکەن و خراپەکاری و ئەنجامەکەی بۆ خواپەرستان و خۆپارێزانە (قصص / ٨٣/٢٨). وتمان: تۆ کەی لەناومان دەڕۆیت؟ وتی: کاتی جیابوونەوە نزیکە، گەڕانەوە بۆ لای خوا، بۆ لای (قەراغی دوورترین) یارێکی ئازیز و بەهەشتی بەرین. وتمان: کێ تۆ بشوات؟ وتی: بنەماڵەکەم. وتمان: بەکام جلوبەرگ داتپۆشین؟ وتی: بەجلەکانی بەرم یا پارچەیەکی سپی. وتمان: کێ لەسەر تۆ نوێژ بخوێنێت؟ وتی: بێدەنگ بن. خوا لێتان خۆش بێت و باشترین پاداشت بە پێغەمبەرەکەتان بدات. ئێمە گریایین و ئەو گریا. وتی: من لەناو تابووتەکە لەلای گۆڕەکەم دابنێن و داوتر بڕۆنە دواوە تا جبرەئیل و ئیسرافیل و میکاییل و فریشتەی مەرگ لەگەڵ فریشتەکانیتر لەسەر من نوێژ بخوێنن. دواتر دەستە دەستە ورەن و لەسەر من نوێژ بخوێنن و بەگریان و شین و ڕۆڕۆ مەمرەنجێنن. لەمنەوە بۆ خۆتان سلاو بنێرن. هەر کەس لەهاورێکانم کەلێرە نییە، سلاوی من بۆ بنێرن. هەر کەس شوێن ئەم ئایینەی ئێوە کەوت، سلاوی بۆ بنێرن.

عەبدوڵڵـە کـوڕی عـەباس دەڵێـت: ڕۆژی پێنجـشەممە، چ پێنجـشەممەیەکی

خەفـەتبار! فرمێـسك لەچـاوكانی كـوڕی عـەباس بـاری. وتـی: نەخۆشـییەكەی پێغەمبەر(د.خ) زیادی كرد و ئازارێكی زۆری پێبڕا. وتی: قەڵەم و كاغەزم بۆ بێنن تا نوسـراوێك بـۆ ئێـوە بنووسـم تـا لـەدوای مـن هـەرگیز گیرۆدەی گـومڕایی نـەبن. ئـەو كەسانەی لەوێ بوون، لەگەڵ یەك لەسەر هێنانی قەڵەم و كاغەز ئاژاوەیان نایەوە. ( شیاو نەبوو لای پێغەمبەر(د.خ) ئاژاوە بنێنەوە). وتیان: ( و بێژەرەكە عومەر كوڕی خەتاب بوو)كە: پێغەمبەری خوا هەڵیت و پڵیت دەڵێت و قسەی قۆڕ دەكات. دواتـر پێیـان وت: قەڵـەم و كاغـەز بێـنین یـا نـەیهێنین؟ وتـی: وازم لـێ بێـنن، ئـەو حاڵـەی تیایـدام باشـترە لـەوەی ئێـوە تۆمـەتبارم دەكـەن پێـی. دواتـر پێـشنیاری سـێ كـاری كرد: بتپەرستەكان لەدوورگەی عەرەبی دووركەنەوە و دەستە نوێنەرایەتییـەكان بـۆ ئەم لاولا بنێرن.... و لەسێیەمی بەئەنقەست بێدەنگ بوو. یا كوڕی عەباس وتی: من لەبیرم كرد.

عـەلی كـوڕی ئـەبی تالیـب لـەكاتی قورسـبوونی نەخۆشییەكەی پێغەمبـەر(د.خ) بـەجێی هێـشت. خـەڵك پرسـیان: پێغەمبـەر(د.خ) چـۆنە؟ وتـی: سـوپاس بـۆ خـوا باشـترە. عـەباس كـوڕی عەبدولموتـەلیب دەسـتیگرت و وتـی: سـێ ڕۆژی دیكـە دەتلـەرزێنن و ئـازارت دەدەن. پێغەمبـەر(د.خ) لـەم نەخۆشـییە چـاك نابێتـەوە و دەمرێـت. مـەرگم لەڕوخـساری مناڵـەكانی عەبولموتـەلیب دەناسمـەوە. بـڕۆ لای پێغەمبـەر(د.خ) و لێـی بپرسـە دوای ئـەو كـێ كاروبارەكـان بگرێتـە دەسـت. عـەلی وتـی: ئەگـەر داوای ئـەوە لەپێغەمبـەر(د.خ) بكـەین، بەئێمـەی ناڵێـت، خـەڵك هـەرگیز بەوە رازی نابن. سوێند بەخوا هیچ كات داوای ئەوە لەپێغەمبەر(د.خ) ناكەم.

دەڵێـت: زۆر لەنیمـەڕۆ تێنەپـەڕیبوو كەپێغەمبـەر(د.خ) ماڵئـاوایی كـرد. عایـشە دەڵێت: ئەسمە كچی عەمیس وتی: ئازاری ئەو جگە لەئازاری سینەی نییە، شیاو دەرمانی پێویستی دەرخوارد بدرێت. ئەوان ئەو كارەیان كرد و كاتێك هاتەهۆش، پرسی، بۆچی ئەو كارەتان كرد؟ وتیان: گومانمان دەكرد تۆ ئازاری سینەت هەیە. وتی: خوا من بەسەر ئەو ئازارەدا زاڵ ناكات. دواتر وتی: كەس لەم ماڵە مەهێڵنەوە مەگەر ئەوەی لەو دەرمانەی دەرخوارد بدەن جگە لەمامم. عەباس لەوێ ئامادە بوو و ئەوان ئەو كارەیان كرد.

ئوسامە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) نەخۆش کەوت، من و هاورێکانم ڕۆشتینە مەدینە و لێی نزیك بووینەوە، ئەو بێدەنگ بوو و هیچی نەدەوت. دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و خستییە سەر من. زانیم لەخوا بۆ من دەپاڕێتەوە. عایشە دەڵێت: بەردەوام لەپێغەمبەری خوام دەبیست کەدەیوت: خوا هیچ پێغەمبەرێك نامرێنێت مەگەر ئەوەی ئازادی بکات (کەلەم دنیا بمێنێت یا بۆ ئەو دنیا کۆچ بکات). دەڵێت: کاتێك، کاتی مردنی ئەو هات، دوایین وشە کەلەو بیستم ئەمەبوو کەدەیوت: (بەڵکو بەهەشتی بەرین). دەڵێت: وتم: سوێند بەخوا ئێمە هەڵنابژێرێت. زانیم ئەویان ئازاد کردووە تا خواستەکەی خۆی هەڵبژێرێت.

کاتێك نەخۆشییەکەی قورس بوو، بیلال بانگی نوێژیدا و پێغەمبەر(د.خ) وتی: بەئەبوبەکر بڵێن لەگەڵ خەڵك نوێژ بخوێنێت. عایشە دەڵێت: وتم: ئەو پیاوێکی دڵنەرمە و کاتێك لەشوێنەکەی تۆدا بێستێت، ئارام نابێت و ئۆقرە ناگرێت. وتی: بەئەبوبەکر بڵێن، پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات. قسەکەم دووبارە کردەوە. وتی: ئێوە ژنان لەو ژنانە دەچن کەلەدەوری یوسف کۆببوونەوە، بەئەبوبەکر بڵێن پێشنوێژی بۆخەڵك بکات. ئەو تووڕە بوو. ئەبوبەکر هەنگاوی نایە پێش، کاتێك بۆ نوێژ وەستا، پێغەمبەر(د.خ) ئارام بوویەوە و بەیارمەتی دووکەس هاتەدەر. هەرئەوەی لەئەبوبەکر نزیك کەوتەوە، ئەبوبەکر ڕۆشتە دواوە. پێغەمبەر(د.خ) ئیشارەی بۆ کرد لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە. پێغەمبەر(د.خ) دانیشت و بەدانیشتان لای ئەبوبەکر نوێژی کرد. ئەبوبەکر بەنوێژەکەی پێغەمبەر(د.خ) نوێژی دەخوێند و خەڵك بەنوێژەکەی ئەبوبەکر. ئەبوبەکر هەفدە نوێژی لەگەڵ خەڵك خوێند. دەستەیەك دەڵێن: بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند. دواتر پێغەمبەر(د.خ) لەهەمان ڕۆژ کەچاوی لەدنیا بەست، بۆ نوێژی بەیانی هاتەدەر و نزیك بوو لەکاتی نوێژ خەڵك بەشادمانی هاتنەدەرەوەی پێغەمبەر(د.خ) ئاژاوە دروست بکەن. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕیز و شکۆی ئەوانی لەنوێژدا بینی، بزەی گرت. دواتر گەڕایەوە بۆ ماڵ و خەڵك گومانیان دەکرد پێغەمبەر(د.خ) لەئازار و ڕەنجەکەی خۆی ڕزگاری بووە. ئەبوبەکر بۆ ماڵەکەی خۆی (سنح) گەڕایەوە. عایشە دەڵێت: پێغەمبەرم بینی گیانی سپارد و لای ئەو کاسەیەك ئاو بوو کەدەستی تێدەکرد و ڕوخساری

تـەڕدەکرد و بـەردەوام دەیـوت: خوایـە، بـۆ زاڵبـوون بەسـەر سـەختییەکانی مـەرگ هاوکاریم بکە. دەڵێت: لەم کاتـەدا کەسێك لەبنەماڵـەی ئەبوبەکر هاتـە ناو ماڵەکە و سیواکێك لەدەستیا بوو. پێغەمبـەر(د.خ) بەشێوەیەك سـەیری ئـەو پیـاوەی کـرد، تێگەیشتم ئەو سیواکەی دەوێت. سیواکەکەم وەرگرت، نەرمم کرد وپێمدا. ددانی خـۆی پـێ پـاککردەوە و خـستییە سـەر زەوی. ئەوسـا لـەداوێنی مـن قـورس بـوو. دەڵێت: بەردەوام سەیری ڕوخساریم دەکرد کەلە ناکاو بینیم چاوەکانی کرانەوە و لەسوڕان کـەوتن. ئـەو بـەردەوام دەیـوت: (بـەڵکو بەهەشـتی بـەرین). دواتـر گیـانی بەڕێزی ئەسپەردە کرد. ئەو لەداوێن و سینەی من گیـانی بەخشی. لەبـەر نـەزانی و کەم تەمەنی من بوو پێغەمبەر(د.خ) لەداوێنی من گیانی بەخشی. مـن سـەریم خستە سـەر سـەرینێك و هـاوڕێ لەگـەڵ ژنـانیتر بـەخۆڕنین و سـەر ڕنـین دەستمان بەشین و گریان کرد.

کاتێـك نەخۆشـییەکەی قـورس بـوو و مـەرگ هەڕەشـەی لێـدەکرد، دەسـتی بەهەڵگرتنی ئاو و تەرکردنی ڕوخساری دەکرد و بەردەوام دەیوت: هـاوار لـەم خەمـە گیانبڕە! کچەکەی فاتیمە بەردەوام دەیوت: باوکە، هـاوار کەخەمەکەت بۆ من چەند خەمهێنـەرە! پێغەمبـەر(د.خ) دەیـوت: ئـیتر لـەمڕۆوە باوکـت خـەمی نییـە. کاتێـك پێغەمبـەر(د.خ) بـێ ئـارامی فاتیمـەی بـینی، ئـەوی بـۆ لای خـۆی بـانگ کـرد و نهێنییـەکی پـێ وت. ئـەو دەسـتی بـەگریان کـرد. بـۆ جـاری دوەم بەگوێـچکەیدا چـرپاندی و ئـەم جـارە فاتیمـە پێکـەنی. کاتێـك پێغەمبـەر(د.خ) مـرد، عایـشە لەهۆکاری ئەم گریان وپێکەنینەی پرسی. فاتیمە وتـی: جاری یەکەم وتـی دەمرم و من دەستم بەگریان کرد، جاری دوەم وتـی لـەناو کەسـەکانم تـۆ لـەپێش هـەموویان پەیوەسـتی مـن دەبیـت و مـن پێکـەنیم. هەنـدێك دەڵـێن فاتیمـە وتـی: جـاری دوەم نهێنییەکی پێ وتم و وتی تۆ شابانوی ژنە بەهەشتیەکانیت و من پێکەنیم.

مەرگی ئـەو لـەڕۆژی دووشـەممە دوای دوانـزە شـەو لـەرەبیع ئەلئـەوەل / ٧ ژوئـەن ٦٣٢ زایـینی بـوو. بـەیانی ئـەو ڕۆژە لـەکاتی نیمـەڕۆ ئـەویان بـەخاك سـپارد. دەستەیەك دەڵێن: لـەکاتی نیوەڕۆی ڕۆژی دووشـەممە، دوو شـەو بـۆ کۆتـایی ڕەبیـع ئەلئەوەل / ٢٣ ژوئەن٦٣٢ زایینی، چاوەکانی لەم جیهانە بەست.

کاتێك مرد، ئەبوبەکر لەماڵەکەی خۆی لە (سنح) بەسەری دەبرد و عومەر ئامادە بوو. ئەو کاتەی گیانیدا، عومەر هەستا و وتی: دەستەیەك لەدووڕووەکان گومان دەکەن پێغەمبەر(د.خ) مردووە. ئەو نەمردووە بەڵکو وەك موسا کوڕی عیمران ڕۆشتۆتە لای خوا. سوێند بەخوا بێ گومان پێغەمبەر(د.خ) دەگەڕێتەوە و بێ چەند و چوون دەست و پێی ئەوانەی گومان دەکەن مردووە، دەبڕێت، ئەبوبەکر هات و بینی عومەر لەگەڵ خەڵك قسە دەکات. ئەو کاتە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و بینی ئەویان لەجلێکەوە ئاڵاندووە و لەسوچێکی ماڵەکە دایاننناوە. پارچەی سەر روخساری هەڵگرت، ماچی کرد ووتی: باوك و دایکم قوربانی تۆ بن کەلەژیان و مەرگ پاك و بۆنخۆش بوویت. ئێستا تامی ئەو مەرگەی خوا بۆی نوسیبووی، چێشتت. دووبارە پارچەکەی کێشایەوە بەروخساری پێغەمبەر(د.خ) و هاتەدەر و بینی عومەر لەگەڵ خەڵك قسە دەکات. پێی فەرموو بێدەنگ بێت. عومەر بەقسەی نەکرد. ئەبوبەکر ڕوویکردە خەڵك و کاتێك وتارەکەی ئەویان بیست، لەدەوری کۆبوونەوە و عومەریان بەجێهێشت. سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، هەر کەس محەممەدی دەپەرەستی، دەبێت بزانێت ئەو مردووە و هەر کەس خوا دەپەرەستێت دەبێت بزانێت ئەو نەمر و هەمیشەییە. دواتر ئەم ئایەیی خوێندەوە: محەممەد، پێغەمبەرێك زیاتر نییە، ئایا ئەگەر بمرێت یا بکوژرێت، ئەو ڕێگایەیی پیای ڕۆشتوون، دەگەڕێنەوە؟ ئەوەی بۆ دواوە بگەڕێتەوە هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنێت و خوا بەزوویی سوپاسکەران پاداشت دەدات (ال عمران / ٣ / ١٤٤). دەڵێت: وەك بڵێی خەڵك ئەم ئایەیان جگە لەو لەکەسیتر نەبیستبوو. عومەر دەڵێت: سوێند بەخوا هەرئەوەندەی ئەم ئایەم لێبیست، لەپێکەوتم و نەمتوانی لەشوێنکەم بجووڵێم. ئێستا بێ گومان زانیم پێغەمبەر(د.خ) مردووە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەم هەواڵە بەمەککە گەیشت و فەرمانداری مەککە عەتابی کوڕی ئەسید کوڕی ئەبی عاس کوڕی ئومەییە بوو. عەتاب خۆی داشارد و مەککە کەوتە جۆش و خرۆش و نزیك بوو خەڵك لەدین هەڵگەڕێنەوە. لەم کاتەدا سوهەیل کوڕی عەمرۆ ڕۆشتە دەرگای کەعبە و خەڵکی بانگ کرد. خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە. وتی: ئەی خەڵکانی مەککە، دوایین باوەڕهێنەران و یەکەمین

هەڵگەڕاوەکان مەبن. سوێند بەخوا ئەم کارە بێ گومان بەهەمان شێوە کەپێغەمبەر(د.خ) وتوویەتی، کۆتایی پێدێت و ئایینەکەی سەرکەوتن بەدەست دێنێت. من ئەوم لەشوێنەکەی خۆی بینی، تەنیا بوو و دەیوت: لەگەڵ من بڵێن ((خوایەك جگە لەخوا نییە))،تا عەرەبەکان دەستەمۆی ئێوە بن و عەجەمەکان باجتان پێ بدەن. سوێند بەخوا بێ گومان ڕۆژێك دەگات ئێوە گەنجەکانی سزار و خوسرەو لەڕێگەی خوادا خەرج بکەن. لەو ڕۆژەدا هەندێ کەس گاڵتەیان پێکرد و هەندێ کەس بەراستگۆیان زانی. ئێوە بینیتان دوای ئەوە چی ڕوویدا. سوێند بەخوا هەموو پێشبینییەکانی ئەو دێنەدی. ئەو دەستە لەخەڵك کەوتاری سوهەیل کوڕی عەمرۆیان بیست، لەسەر دینەکەیان مانەوە و هەڵنەگەڕانەوە. ئەم شوێنە و ئەو وتارەی لەپێغەمبەری خوا باسی کرا، ئەوە بوو کە سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەشەڕی بەدر ئەسیر کرا و لەو کاتەدا پێغەمبەر(د.خ) بەعومەر کوڕی خەتابی ئەمەی وت کەئاماژەمان پێدا.

## داستانی ( سەقیفە )و خەلافەتی ئەبوبەکر

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەنسار لەشوێنی منداڵەکانی ساعدە کۆبوونەوە تا لەگەڵ سەعد کوڕی عبادە بەیعەت ببەستن. ئەم هەواڵە بەگوێی ئەبوبەکر گەیشت وئەو هاورێ لەگەڵ عومەر و ئەبوعوبەیدەی جەراح ڕۆشتە لای ئەوان و پرسی: ئەمە چ کارێکە دەیکەن؟ وتیان: فەرمانڕەوایەك لەئێمە بێت و یەك لەئێوە. ئەبوبەکر وتی: فەرمانڕەواکان لەئێمە بن و لەئێوە وەزیران. ئەبوبەکر وتی: من بۆ ئێوە یەك لەم دوو پیاوە هەڵدەبژێرم: عومەر یا ئەبوعوبەیدە ئەمینی ئەم خەڵکە. عومەر وتی: گیانی کامە لەئێوە بەمە ئارام دەگرێت کەدوو هەنگاو بنێنە پێش، کە پێغەمبەر(د.خ) ئەو هەنگاوەی نایە پێش؟ (چوونکە ئەوی بۆ نوێژ کردن لەجیاتی خۆی دانا)ئەوسا عومەر بەیعەتی لەگەڵ کرد و خەڵکیش. ئەنسار یا دەستەیەك لەئەنسار وتیان: جگە لەگەڵ عەلی لەگەڵ کەس بەیعەت ناکەین. دەڵێت: عەلی و منداڵەکانی هاشم و زوبەیر و تەڵحە بەیعەتیان لەگەڵ ئەبوبەکر نەکرد. زوبەیر وتی: شمشێر ناکەمە ناو کالان تا لەگەڵ عەلی بەیعەت نەکەن. عومەر وتی: شمشێرەکەی بگرن و لەبەردی

بدەن. ئەوسا عومەر هات، ئەوانی گرت و ناچاری کردن بەیعەت بدەن.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك عەلی لەبەیعەت بۆ ئەبوبەکر ئاگادار بوویەوە، خێرا بەکراسێك، بێ عابا هات و بەیعەتی پێدا و ئەوسا داوای عاباکەی کرد و پۆشی.

ڕاستییەکەی ئەوەیە: عەلی دوای شەش مانگ بەیعەتی کرد و خوا زاناترە.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك خەڵك بۆ بەیعەت دان بەئەبوبەکر کۆبوونەوە، ئەبوسوفیان بەپەلە هات و بەردەوام دەیوت: من ئاژاوەیەك دەبینیم کەتەنیا بەخوێن دادەمرکێتەوە. ئەی مناڵەکانی بنەماڵەی مەناف، ئەبوبەکر چییە تا کاروبارەکانی ئێوە بگرێتە دەست؟ ئەو دوو پیاوە زەمان گیراوە لەکوێن؟ ئەو دوو پیاوە سەرکوتکراوە لەکوێن. عەلی و عەباس چییان بەسەر هاتووە؟ بۆ دەبێت فەرمانڕەوایی بکەوێتە دەستی کەمترین بنەماڵەی قورەیش؟ دواتر بەعەلی وت: دەستی خۆت بکەرەوە تا بەیعەت بەتۆ بدەم و سوێند بەخوا بێ چەند و چون سەراسەری ئەم شارە پڕدەکەم لەسوارە وپیادە بۆ تۆ. عەلی بەم کارە رازی نەبوو. ئەبوسوفیان ئەم وتارەی مزتەلەمیسی بەنمونە هێنایەوە:

| | |
|---|---|
| ولن يقيم على خسف يرادبه | الا الاذلان عير الحي و الوتد |
| هذا على الخسف مربوط برمته | وذايدق فلا يرثى له احد |

واتاکەی: جگە لەدوو کەس بەو ستەمەی لێیان دەکرێت، ئارام ناگرن، کەری دێ و بزماری ئاسن. ئەوەیان بەتەنافێکی کۆن بەزەوییەوە دەبەستن و ئەمەیان بەردەوام دادەکوتن و کەس بۆی ناگریت و فرمێسك ناڕژێت.

عەلی ئەوی لەخۆی دوور کردەوە و وتی: تۆ لەم کارەت جگە لەئاژاوە نانەوە مەبەستێکیترت نییە. سوێند بەخوا زۆر دەمێکە بەردەوام زیان لەئیسلام دەدەیت و بیری خراپی لێدەکەیتەوە. ئێمە پێویستمان بەئامۆژگاری تۆ نییە.

عەبدوڵڵە کوڕی عەباس دەڵێت: من قورئانم فێری عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف دەکرد، کەعومەر کوڕی خەتاب حەجی کرد و ئێمە لەگەڵ ئەو حەجمان کرد. عەبدولڕەحمان بەمنی وت: ئەمڕۆ لەمەنی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بووم. کەسێك پێی وت: لەفلان کەسم بیست دەیوت: ئەگەر عومەر بمرێت، لەگەڵ فلان کەس بەیعەت دەکەم. عومەر وتی: ئەمشەو لەناو خەڵك وتار دەدەم و ئەوان

لەمەترسییەکانی ئەم دەستە ئاگادار دەکەمەوە کەدەیانەوێت بەزۆر فەرمانڕەوایی بگرنە دەست. دەڵێت: وتم: ئەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، شوێن و ئایینی حەج کردن، شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکانە و زۆرن ئاژاوەگێران و ئەوانەن بەسەر کۆرەکانی تۆ زاڵ دەبن. دەترسم قسەیەك بکەیت بەگیان و دڵ گوێی لێنەگرن بەڵکو بەم لاولادا بڵاوی بکەنەوە. ماوەیەك چاوەڕێ بکە تا بڕۆیتە مەدینە و لەگەڵ هاوەڵە تایبەتەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەتەنیا بیت و ئەوەی دەتەوێت بیهێنیتە سەرزمان تا بەگیان و دڵ گوێت لێبگرن. وتی: سوێند بەخوا لەیەکەم کۆبوونەوە لەمەدینە هەڵدەستم و قسە دەکەم.

دەڵێت: کاتێك گەشتمە مەدینە، لەگەرمای سوتێنەری رۆژی هەینی شوێن وتارەکەی عەبدولرەحمان کەوتم و ڕۆشتمە ناو مزگەوت. کاتێك عومەر لەسەر تەختی وتاردان دانیشت، سوپاسی خوای کرد و سەبارەت بەئاییینی سەنگسار کردن قسەی کرد و ڕوونیکردەوە کە ئەم ئایە لەقورئاندا نەماوە. وتی: بەمنیان وتووە کەسێك لەئێوە وتوویەتی، ئەگەر من بمرم، لەگەڵ فلان کەس بەیعەت دەکەم. ئاگاردار بن، نەکا کەسێك فریوبخوات و بڵێت: بەیعەت لەگەڵ ئەبوبەکر ئاژاوەیەکی تێپەڕ بوو. ڕاستییەکەی بەوشێوە بوو بەڵام خوا زیانەکەی لەئێمە دوور کردەوە. لەناو ئێوەدا کەسێك نییە هاوشێوەی ئەبوبەکر، هەموو سەرنجەکان بۆ لای خۆی رابکێشێت. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەو باشترین کەس لەناو ئێمەدا بوو. عەلی و زوبەیر و شوێنکەوتووانیان خۆیان دوورەپەرێز گرت و لەماڵی فاتیمە کۆبوونەوە. ئەنساریش خۆیان دوورەپەرێز گرت و موهاجیرەکان ڕوویان لەئەبوبەکر کرد. پێم وت: با پێکەوە بڕۆینە لای برا ئەنسارییەکانمان. ئێمە ڕۆشتینە لایان و لەگەڵ دوو پیاوی شیاو گفتوگۆمان کرد کەیەکیان عوەیم کوڕی ساعدە و ئەویتریان مەعن کوڕی عودەی بوو. ئەو دووانە بەئێمەیان وت: بڕۆن و کارەکەی خۆتان لەناو خۆتان کۆتایی پێبێنن. وتی: ئێمە ڕۆشتینە لای ئەنسار کە لەشوێنی منداڵەکانی ساعدە کۆببوونەوە ولەناو ئەوان پیاوێك بوو لەپارچەیەکی سپیان پێچابوو. وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: سەعد کوڕی عبادەیە کەئازارێکی لەجەستەیدا هەیە. لەم کاتەدا پیاوێك لەناویان هەستا، لەخوا پاڕایەوە و سوپاسی کرد و وتی: ئێمە

ئەنسارییەکانین و دەستە شەڕکەرەکانی ئیسلام و قورئان. ئێوە قورەیشییەکان دەستەیەکی کەمن لەناو ئێمە کەچەندین دەستە لەخەڵکەکەتان پەیوەستتان بوون و بەپەلە ڕوویان لەم شارە کردووە. هەنوکە ئەوان دەیانەوێت بەزۆر فەرمانڕەوایی لەدەست ئێمە دەربێنن. ئەو بێدەنگ بوو، من خۆم ئامادە کردبوو لەپاڵ ئەبوبەکر قسەکانم بێنمە سەرزمان. کاتێك ویستم دەست پێبکەم، ئەبوبەکر وتی: دەمت داخە، ئەو هەستا و سوپاسی خوای کرد و پاڕایەوە و هیچ مەبەستێکی ناو دڵی منی پشت گوێ نەخست مەگەر ئەوەی هێنایە سەرزمان یا بەشێوەیەکی جوانتر و پاراوتر وتی. وتی: ئەی ئەنسارییەکان، ئێوە هەر لەپێشیەك بۆخۆتان دابنێن، شیاون بۆی. بەڵام عەرەبەکان فەرمانڕەوایی ئیسلام تەنیا بۆ قورەیشییەکان دەزانن کەلەپێشترینی بنەماڵەکانی عەرەب و بەڕێزترینی ئەوانن. من بۆ ئێوە یەك لەم دوو پیاوە هەڵدەبژێرم، ئەو دەستی من و دەستی ئەبوعوبەیدەی جەراحی گرت. من لەناو وتارەکەی ئەو، تەنیا ئەم وشانەم پەسەند نەکرد. ئەگەر گەردنی منیان لەڕێگەی کارێکدا لێدەدا کەمنی لە هیچ گوناحێك نزیك نەدەکردەوە، پێم خۆشتر بوو لەوەی فەرمانڕەوایەتی خەڵکێك بکەم ئەبوبەکر لەناو ئەواندا بێت.

کاتێك ئەبوبەکر وتارەکەی خۆی کۆتایی پێهێنا، پیاوێك هەستا و وتی: لەناو ئێمە فەرمانڕەوایەك بێت و لەناو ئێوە فەرمانڕەوایەك. دەنگە دەنگ لەهەر لایەکەوە بەرز بوویەوە، چوونکە لەئاژاوە دەترسام بەئەبوبەکرم وت: دەستی خۆت بکەرەوە تا بەیعەتت پێبدەم. ئەو دەستی خۆی هێنایە پێش، من بەیعەتم لەگەڵ کرد و خەڵکیش بەیعەتیان کرد. ئەو کاتە بەسەر سەعد کوری عبادە ڕۆشتین و ئەوێمان بەجێهێشت. یەکێك لەوان وتی: سەعدتان کوشت. وتم: خوا سەعد بکوژێت! سوێند بەخوا ئێمە کارێکی بەهێزترمان جگە لەبەیعەت لەگەڵ ئەبوبەکر نەکرد. بەردەوام دەترسام ئەگەر لەو خەڵکە جیاببمەوە و بەیعەت نەدەن، دوای ئێمە بەیعەت بەیەکیتر بدەن. دواتر دەبێت یا شوێن ئەوان بکەوین لەوشتەی بەپەسەندی نازانین و یا دژایەتی بکەین و دووبەرەکی دروست ببێت.

باوکی عەمرەی ئەنساری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەنسار لەشوێنی منداڵەکانی ساعدە کۆبوونەوە و سەعد کوری عبادەیان هێنایەدەر تا بیکەنە

فەرمانڕەوایی خۆیان و کاروبارەکان بەو بسپێرن. نەخۆش بوو. دوای ئەوەی سوپاسی خوای کرد، وتی: ئەی ئەنسارییەکان، ئێوە لەپێشییەکەتان هەیە هیچ کام لەعەرەبەکان نیانە. محەممەد بۆ ماوەی دە ساڵ و ماوەیەك لەناو ئێوەدا ژیا و بانگەوازی پێغەمبەری خۆیان بەوان راگەیاند و جگە لەدەستەیەکی کەم باوەڕیان پێی نەهێنا. ئەم دەستە کەمە نەدەیانتوانی بیپارێزن، نە ئایینەکەی بەهێز بکەن و نەستەمی لێ دووربکەنەوە تا ئەوەی خوا ویستی لەپێشی بەئێوە ببەخشێت و لەبەر ئەمە، رێزداری بەئێوە بەخشی و باوەڕی دەرخواردان و کارێکی کرد ئێوە ڕووبکەنە پێغەمبەر(د.خ) وئایینەکەی بپارێزن و بلاوی بکەنەوە و خۆتان بەرێز و شەڕی دوژمنان بکەن. ئێوە سەختگیرترینی خەڵکان لەسەر دوژمنەکانی بوون تا عەرەبەکان باوەڕیان هێنا و خوازراو یا نەخوازراو لەبەرابەر ئەو کوڕنوشیان برد و دووردەستەکان بەڕێسوایی فەرمانبەریان کرد و عەرەبەکان لەبەر ڕووناکی شمشێری ئێوە دەستەمۆی پێغەمبەر(د.خ) بوون. خوا ئەوی ڕەزامەند و شادمان لەئێوە بردەوە. کاروبارەکان بگرنە دەست و کەس مەکەنە شەریکی خۆتان چوونکە تایبەتە بۆ ئێوە و شیاو نییە بۆ کەسانیتر.

هەموویان هاواریان کرد: لەنیشاندانی راستی و دروستی بەختەوەر بوویت و بۆچوونێکی راستت دەربڕی. ئێمە ئەم کارە بەتۆ دەسپێرین کەهۆکاری پشت گەرمی باوەڕداران و ڕەزامەندی ئەوانت پێبراوە. دواتر ئەوان لەناو خۆیان گفتوگۆیان کرد و وتیان: ئەگەر موهاجیرەکان و قورەیش رازی نەبوون و بڵێن ئێمە یەکەم هاوڕێیان و کۆچکەرانی ڕێگەی خواین و کەس و کار و پشتیوانی ئەوین (چ وەڵام دەدەنەوە و چی دەکەن؟) دەستەیەك وتیان: دەڵێن: لەئێمە فەرمانڕەوایەك بێت و لەئێوە فەرمانڕەوایەك. جگە لەمە بەهیچیتر رازی نابین. سەعد وتی: ئەمە سەرەتایی شکست و لاوازییە.

عومەر ئەم هەواڵەی بیست و ڕۆشتە ماڵی پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر لەوێ بوو. پەیامی بۆ نارد تا بێتەدەر. ئەبوبەکر وەڵامیدایەوە، گرفتارم. عومەر وتی: کارێك هاتۆتە پێش کەدەبێت بەناچاری لەوێ ئامادە بێت. ئەبوبەکر هاتەدەر و عومەر ئاگاداری کردەوە. ئەو دووانە لەگەڵ ئەبوعوبەیدەی جەراح بەپەلە ڕۆشتنە لای

ئەنسارییەکان. عومەر وتی: من ڕۆشتمە لای ئەوان و وتارم ئامادە کردبوو تا لەگەڵ ئەوان باسی بکەم. کاتێك نزیکبووینەوە، ئەبوبەکر منی بێدەنگ کرد و هەموو ئەو شتانەی من دەمویست، هێنایە سەرزمان. سوپاسی خوای کرد و وتی: خوا لەناو ئێمە پێغەمبەریکی هەڵبژارد تا شایەتی کرداری ئێمە بێت و ئۆمەتەکەی بپارێزێت، تا خوا بپەرەستن و باوەڕ بەتاقانەیی ئەو بێنن. ئەوان جیاواز لەو، خوا بەردین و دارەکانیان دەپەرەستی. بۆ عەرەبەکان دژوار بوو دەستبەرداری ئایینی باوکانی خۆیان بن. خوا یەکەم کۆچکەرانی لەناو خەڵکەکەی ئەو هەڵبژارد چوونکە ئەویان بەراستگۆ زانی و دار و نەداری خۆیان بەو بەخشی و لەبەرابەر ئازار و سەختگیری و بەدرۆزن زانینی کەسانیتر خۆڕاگریانکرد و ئەمە لەکاتێکدا بوو هەموو خەڵکان دژایەتیان دەکرد وئەوانیان بەسووك دەزانی. ئەوان لەکەمی ژمارەی خۆیان نەترسان و دوژمنی خەڵکیان لەگەڵ خۆیان بەهیچ زانی. ئەوانە یەکەم کەسانی سەر زەوی بوون خوایان پەرەستی و باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێنا. ئەوان هاوڕێیان و کەسەکانی ئەون وبۆ ئەم کارە لەهەموو خەڵکان شیاوترن کەجگە لەستەمکاران کەس دژایەتی ئەوان ناکات. ئێوە ئەی ئەنسارییەکان، ئەو کەسانەن ناتوانن لەپێشی خۆتان لەئیسلام لەبەرچاو نەگرن و پێشینەتان لەم ئایینەدا پشت گوێ بخەن. خوا بەوە لەئێوە رازییە هاوڕێیانی پێغەمبەر(د.خ) و دینەکەی بن و خەڵکی خواپەرەست بۆ لای ئێوە کۆچ بکەن. دوای یەکەم کۆچکەران کەس پلە وپێگەی ئێوە نییە. ئێمە فەرمانڕەواکان دەبین و ئێوە وەزیرەکان. راوێژ کردنی ئێوە پشت گوێ ناخەین و بێ ئێوە هیچ کارێك ئەنجام نادەین.

لەم کاتەدا حوباب کوڕی مونزەر کوڕی جەموح هەستا و وتی: ئەی ئەنسارییەکان، کارەکانی خۆتان بگرنە دەست تاخەڵك لەسێبەری ئێوەدا ئاسودەبن و کەس بوێری ئەوەی نەبێت دژایەتی ئێوە بکات و جگە لەمەبەستەکەی ئێوە ئەنجام بدات. ئێوە بەرێز و بەهێز و زۆر و پارێزراون. خەڵکان سەیری ئێوە دەکەن کەچی دەکەن. ناسازگاری و ناهاوئاهەنگی مەکەن کە سیلسیلەی کاروبارەکان لەدەستتان دەڕوات وژیانتان بەفیڕۆ دەدرێت. موهاجیرەکان جگە لەوەی بیستان بەهیچیتر رازی نابن. ئێستا دەبێت فەرمانڕەوایەك لەئێمە بێت ویەك لەوان.

عومەر وتی: هەرگیز دوو شمشێر لەیەك كالآن جێگەیان نابێتەوە! سوێند بەخوا عەرەبەكان بەم كارە رازی نابن ئێوە بكەنە فەرمانڕەوایی خۆیان چوونكە پێغەمبەر(د.خ) نەژادی ناچێتە سەر ئێوە. بەلآم عەرەبەكان بەوە رازی دەبن كاروبارەكای خۆیان بدەنەدەست كەسانێك پێغەمبەر(د.خ) لەنەژادی ئەوان بووبێت. ئێمە بۆ ئەم كارە شیاوین. كێیە ئەو كەسەی پاشایەتی محەممەد لەئێمە وەربگرێت لەكاتێكدا ئێمە هاورێیان و كەسانی ئەوین!

حوباب كوری مونزەر هەستا و وتی: ئەی ئەنسارییەكان! كاروبارەكانی خۆتان بگرنە دەست و گوێ لەوتاری ئەم پیاوە و هاورێكانی مەگرن كەبەهرەی ئێوە لەم كارەدا بەفیرۆ دەدەن. ئەگەر بەم مەبەستە رازی نەبوون، ئەوان لەم سەرزەمینە دوربكەنەوە وخۆتان فەرمانرەوایی بكەن چوونكە سوێند بەخوا ئێوە بۆ ئەم كارە شیاوترن. بەشمشێرەكانی ئێوە بوو خەلك بوونە فەرمانبرداری ئەم ئایینە. من باوكی شێر منالآ لای شێرەكانم. سوێند بەخوا! سوێند بەخوا ئەگەر بتانەوێت، سەر لەنوێ دەست پێدەكەینەوە.

عومەر وتی: ئەوسا خوا تۆ بكوژێت. حوباب وتی: خوا تۆ بكوژێت!

ئەبوعوبەیدە وتی: ئەی ئەنسارییەكان، ئێوە یەكەم كەسانن هاوكاری پێغەمبەر(د.خ) و ئەم ئایینەتان كرد، یەكەم كەسان مەبن رێگە بگۆرن و پشت بكەنە ئەم ئایینە. لەم كاتەدا بەشیر كوری سەعد ئەبو نەعمان كوری بەشیر هەستا و وتی: ئەی ئەنسارییەكان، سوێند بەخوا هەرچەندە ئێمە لەشەر كردن لەگەلآ بتپەرستەكان و كەلك وەرگرتن لەئیسلام پێشینە و لەپێشیمان هەیە، لەم گیانبازییە جگە لەرەزامەندی خوا و فەرمانبرداری پێغەمبەر(د.خ) و ئەنجامی هەولەكانی سەرشانمان هیچ مەبەستێكیترمان نەبووە. ئێستا شیاو نییە لەمبارەوە دژایەتی خەلك بكەین و چاو لەمەبەستەكانی ئەم دنیایە بگرین. محەممەد لەقورەیشییەكانە و خەلكەكەی بۆ ئەم كارە شیاوترن. سوێند بەخوا هەرگیز كەس من نابینێت لەسەر ئەم بابەتە دژایەتی كەس بكەم. لەخوا بترسن و دژایەتی ئەم خەلكە مەكەن.

ئەبوبەكر وتی: ئێستا عومەر و ئەبوعوبەیدە لێرەدان، ئەگەر دەتانەوێت بەیعەتیان لەگەلآ بكەن. ئەم دووانە وتیان: سوێند بەخوا بەبوونی تۆ بەم كارە رازی

نابین چوونکە تۆ باشترینی موهاجیرەکان و جێگری پێغەمبەری لەنوێژ کردن. نوێژ دیارترین کاری دیاری ناو موسوڵمانانە. دەستی خۆت بێنە پێش تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستین. کاتێك ڕۆشتن تا بەیعەتی لەگەڵ بکەن، بەشیر کوڕی سەعد پێش ئەو دووانە کەوت و بەیعەتی کرد. حوباب کوڕی مونزەر بانگی کرد و وتی: ئەی پیاوی پەیوەندی پچڕێن، دنیات بەدڵت بێت، ئایا چاوت نەیدەتوانی فەمرانڕەوایی کوڕە مامەکانت ببینێت؟ بەشیر وتی: سوێندد بەخوا بەو شێوە نەبوو، بەڵکو ترسام ماف ئەم خەڵکە پێشێل بکەم.

کاتێك ئەوسییەکان بینیان بەشیر چیکرد و خەزرەجییەکان لەهێنانە سەر کاری سەعد کوڕی عبادە چ مەبەستێکیان هەیە، ئەسید کوڕی حەزیر کەسەروەری ئەوان بوو، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خەزرەجییەکان بێنە سەرکار، بۆ هەمیشە شانازیتان بەسەرەوە دەکەن و هەرگیز هیچ بەهرەیەك بەئێوە نادەن. هەستن و لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەت بکەن. خەڵك هەستان وبەیعەتیان لەگەڵ کرد و پیلانەکەی سەعد و خەزرەج هەڵوەشایەوە. خەڵك لەهەر لایەکەوە بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ ئەبوبەکر ڕوویانتێکرد.

دواتر سەعد کوڕی عباد گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی وچەند ڕۆژێك لەو حاڵەدا مایەوە. ئەبوبەکر کەسی بۆ لای نارد تابێت و بەیعەت بکات چوونکە خەڵك بەیعەتیان کردووە. سەعد وتی: سوێند بەخوا بەیعەت ناکەم تا هەموو تیرەکانی ناو تیردانەکەی خۆم بۆ ئێوە بهاوم و ڕمەکەم لەئێوە تێراو بکەم و شمشێرەکەی خۆم بخەمە کار و هاوڕێ لەگەڵ بنەماڵە و شوێنکەوتووانم شەڕی ئێوە بکەم و ئەگەر پەرییەکان و خەڵکان کۆببنەوە، لەگەڵ ئێوە بەیعەت ناکەم تا دەڕۆمە بینینی خواوەند یا لەم ڕێگادا گیان دەدەم. عومەر وتی: نابێت دەسبەرداری بیت تا بەیعەت دەکات. بەشیر کوڕی سەعد وتی: ئەو ڕێگەی ناسازگاری گرتۆتەبەر، لەگەڵ ئێوە بەیعەت ناکات مەگەر ئەوەی لەم ڕێگادا بکوژرێت و ناکوژرێت مەگەر ئەوەی هەموو کەسەکان و شوێنکەوتوانەکەی بکوژرێن. دەستبەرداربوونی زیان بەئێوە ناگەیەنێت. ئەو پیاوێکی تەنیایە. ئەویان پشت گوێ خست.

لەم کاتەدا پیاوەکانی هۆزی ئەسلەم هاتن و بەیعەتیان کرد وئەبوبەکر بەوان

بەهێزبوو. دوای ئەوە خەڵكان هاتن و بەیعەتیان كرد.

دەڵێن: عەمرۆ كوڕی حەریس بەسەعید كوڕی زەیدی وت: كەی بەیعەتیان لەگەڵ ئەبوبەكر كرد؟ وتی: ڕۆژی مردنی پێغەمبەر(د.خ). نەیانویست تەنانەت نیو ڕۆژ بێ كۆبوونەوەیەك بەسەر ببەن.

زوهـری دەڵێـت: عـەلی و منداڵـەكانی هاشـم و زوبـەیر شـەش مـانگ مانـەوە و بەیعـەتیان لەگـەڵ ئەبوبـەكر نـەكرد تـا فاتیمـە كـچی پێغەمبـەر(د.خ) مـرد. ئەوسـا بەیعەتیان كرد.

كاتێـك بـەیانی داهـات و ڕۆژێـك بەسـەر بەیعـەتی ئەبوبـەكر تێپـەڕی، ئـەو لەسـەر تـەختی وتـاردان لەسـەر مینبـەر دانیـشت و خـەڵك بەشـێوەیەكی گـشتی بەیعـەتیان لەگــەڵ كــرد. دواتــر سوپاســی خــوای كــرد و وتــی: ئــەی خەڵكینــە، مــن بــووم بەفەرمانڕەوایی ئێوە، بەڵام باشترینی ئێوە نیم. ئەگەر چاكەم كرد، هاوكاریم بكەن و ئەگەر خراپەم كرد، ڕێگەی چاكەم نیشان بدەن. ڕاستی ئەمانەتە و درۆ خیانـەت. ناتـەوانی ئێـوە لای مـن بەتوانایـە تامافەكـەی وەربگـرم و بـەتوانای ئێـوە لای مـن ناتەوان تا مافی لێوەربگرم. ئەمانە بەویستی خوایە. هیچ كام لـەئێوە پشت ناكاتە شەڕ، چوونكە هیچ خەڵكێك دەستیان لەشەڕ هەڵنەگرت مەگەر ئەوەی ڕیسوا بوون. تا ئەوكاتەی فەرمانبەری خوا و پێغەمبەرەكەی بم، فەرمانبرداری من بن و ئەگەر من لەفەرمانی خوا و پێغەمبەرەكەی دووركەوتمەوە، مافی فەرمانڕەواییم بەسەر ئێوەوە نییە. هەستن وبۆ نوێژ بێستن. خوا لێتنان خۆش بێت.

## ڕێورەسمی شۆردن و ئامادە کردن و بەخاك سپاردنی پێغەمبەر( د.خ )

کاتێك خەڵك لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان بەست، ئەو دەستی بەئامادە کردنی پەیکەری پاکی پێغەمبەر(د.خ) بۆ بەخاکسپاردن کرد. دەستەیەك دەڵێن: سێ ڕۆژ بەخاکیان نەسپارد و لەسەر زەوی مایەوە. ئەویان ڕۆژی سێشەممە بەخاك سپارد. وتاری یەکەم ڕاسترە. ئەوانەی شۆردنی پێغەمبەریان گرتە ئەستۆ، عەلی، عەباس، فەزل کوڕی عەباس، قوسەم کوڕی عەباس، ئوسامە کوڕی زەید و شوقران کۆیلەکەی پێغەمبەر(د.خ) بوون. ئەوس کوڕی خەولی ئەنساری کە لەبەدرییەکان بوو، لەم کارەدا بەشداری کرد. عەباس و دوو کوڕەکەی ئەم دیو و دیویان کرد و شوقران و ئوسامە ئاویان پیا دەکرد و عەلی ئەوی شۆرد و کراسەکەی لەبەر ئەودا بوو. عەلی بەردەوام دەیوت: دایك و باوکم بەقوربانی تۆبن، چەند پیاوێکی بۆنخۆش بوویت لەژیان و لەمردندا. لەپێغەمبەری خوا، ئەوەی لەمردەوەکانیتر دەبینرێت، نەبینرا.

هاوڕێکان سەبارەت بەچۆنییەتی شۆردنی پێغەمبەر(د.خ) جیاوازیان بوو کەئایا بەجلەوە بیشۆن یا بەڕووتی. خوا خستیە خەوی کەسێکیان (نەزانرا ئەو کەسە کێیە) وپێی وتن پێغەمبەر(د.خ) بەجلەکانییەوە بشۆن. ئەو کارەیان کرد.

پێغەمبەریان لەسێ پارچەدا کفن کرد: دوو پارچە (سوحاری) و یەك بۆرد (ڕوپۆش) (حیبرە). ئەویان بەتوندی لەم سێ پارچەوە ئالاند.

سەبارەت بەشوێنی بەخاك سپاردنی کێشەیان بۆ دروست بوو. ئەبوبەکر وتی: لەپێغەمبەری خوام بیست وتی: هیچ پێغەمبەر(د.خ) نامرێت، مەگەر ئەوەی لەشوێنی مردنەکەی بەخاکی بسپێرن. لەبەر ئەمە جێگەکەیان هەڵگرت و لەشوێنەکەی خۆیدا بەخاکیان سپارد. ئەبوتەڵحەی ئەنساری گۆڕی ئەوی هەڵکەند و خەڵك دەستە دەستە هاتن و نوێژیان لەسەر خوێند: پیاوان، ژنان، منالان، کۆیلەکان. شەوی چوارشەممە بەخاکیان سپارد. ئەوەی ڕۆشتە ناو گۆڕەکەی، عەلی کوڕی ئەبی تالیب و فەزل کوڕی عەباس و قوسەم کوڕی عەباس و شوقران بوون. ئەوس کوڕی خەولی ئەنساری بەعەلی وت: سوێندت دەدەم لەئارامگای

پاکی پێغەمبەر(د.خ) بەهرەیەکەم پێ ببەخشی. عەلی وتی: وەرەخوار و ئەو ڕۆشت.

موغەیرە کوڕی شەعبە بانگەشەی ئەوەی دەکرد دوایین کەسە چاوی بەپێغەمبەر(د.خ) کەوتبێت. دەیوت: ئەنگوستیلەکەم بەئەنقەست خستە ناو گۆڕەکەی و ڕۆشتمەخوار و هەڵمگرتەوە. دەستەیەك لەعێراقییەکان لەمبارەوە پرسیاریان لەعەلی کرد. وتی: موغەیرە درۆی کردووە. دوایین کەس قوسەم کوڕی عەباس بوو چاوی بەپێغەمبەر(د.خ) کەوت.

سەبارەت بەساڵەکانی ژیانی جیاوازی هەیە. کوڕی عەباس و عایشە و معاویە و کوڕی موسەیب دەڵێن: شەست وسێ ساڵ. دووبارە کوڕی عەباس و دەغفەل کوڕی حەنزەلە دەڵێن: شەست وپێنج ساڵ. عەمرۆ کوڕی زوبەیر دەڵێت: شەست ساڵ.

## ڕەوانە کردنی سوپاکەی ئوسامە

پێشتر ئاماژەمان پێدا پێغەمبەر(د.خ) ئوسامەی کردە فەرماندەی سوپایەك و فەرمانی پێدا ڕەوانەی شام ببێت. ئەو کۆبوونەوەی لەسەر خەڵکانی مەدینە و دەوروبەری و لەناو ئەوان عومەر کوڕی خەتابی کردەبووە شتێکی پێویست. پێغەمبەر(د.خ) مرد و سوپاکەی ئوسامە بەرێنەکەوت. لەم کاتەدا عەرەبەکان بەشێوەیەکی گشتی یا تایبەت لەهەر هۆزێك، لەدین هەڵگەڕانەوە و دوڕوویی ئاشکرا بوو و جوولەکە و مەسیحییەکان سەیری چۆنییەتی ڕووداوەکانیان دەکرد. موسوڵمانان وەك ڕانەمەڕێك کەشوانەکەی ون کردبێت، لەشەوێکی تاریك و بارانی بێ سەرپەرەست و پەنا مانەوە چوونکە پێغەمبەرەکەیان کۆچی دوایی کردبوو، ژمارەیان کەم و ژمارەی دوژمنان فراوان. خەڵك بەئەبوبەکریان وت: ئەمانە یانی سوپای ئوسامە، سوپای موسوڵمانانن و عەرەبەکان بەوشێوەی دەبینی، دژی تۆ ڕاپەڕیون. کەواتە ڕەوا نەبوو دەستەیەکی زۆر لەموسوڵمانەکان لەدەوری تۆ بڵاوەی لێبکەن. ئەبوبەکر وتی: سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، ئەگەر بزانم ددان هەڵدەکێشن و فڕی دەدەن، سوپاکەی ئوسامە بەهەمان شێوە کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمانیداوە، ڕەوانە دەکەم. ئەو لەناو خەڵك وتاریدا و فەرمووی

بۆ شەڕ خۆیان ئامادە بکەن و هەرکەس لەناو سوپاکەی ئوسامەدا بووە (و بۆ شار گەڕاوەتەوە) بۆ لەشکرگەکەی لە (جورف) بگەڕێتەوە. ئەوان بەهەمان شێوە کەفەرمانیان پێدرابوو، ڕۆشتن و ئەبوبەکر پاشماوەی ئەو هۆزانەی بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان کۆچیان کردبوو، بۆ شەڕ ئامادە کرد و لەوان چەندین شوێنی پاراستنی بەدەوری هۆزەکانیان دروست کرد (تا لەشۆڕش یا ئاژاوەگێری ئەوان ڕێگری بکات و هەروەها ئەمان لەبەرابەر هێرشی کەسانیتر بپارێزن). بەڵام ژمارەیان کەم بوو.

کاتێك سوپاییەکان ڕۆشتنە شوێنی کۆبوونەوەی لەشکر لەجۆرف، ئوسامە عومەر کوڕی خەتابی (کە لەناو سوپاکەدا بوو) ناردە لای ئەبوبەکر و داوای لێکرد بگەڕێتەوە. ئەو لەپەیامەکەی خۆی بۆ ئەبوبەکر وتی: سەروەر و گەورەکانی خەڵك لەگەڵ منن و من بۆ جێگری پێغەمبەر(د.خ) و بارەگا و بنەماڵە و کەسەکانی ئەو نیگەرانم و دەترسم بتپەرستەکان ئازاریان پێبگەیێنن. هاوڕێیانی ئوسامە لەئەنسار بەعومەر کوڕی خەتابیان وت: ئەبوبەکر جێگری پێغەمبەری خوایە، ئەگەر پێداگری کرد بەرێگەی خۆماندا بڕۆین، پەیامێکی لەئێمەوە بۆ ببە و داوا بکە فەرماندەیی ئێمە بەکەسێکی بەتەمەنتر لەئوسامە بسپێرێت.

عومەر بەفەرمانی ئوسامە ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و لەپەیامەکەی ئوسامە ئاگاداری کردەوە. ئەبوبەکر وتی: ئەگەر سەگ و گورگ پەلاماری من بدەن و بمڕفێنن، سوپاکەی ئوسامە بەهەمان شێوە کەپێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی، ڕەوانە دەکەم و فەرمانێك پێغەمبەری خوا فەرمانی پێداوە، پشتگوێ ناخەم و ئەگەر لەم شارانەدا کەس جگە لەخۆم نەمێنێتەوە، دووبارە ڕەوانەی دەکەم. عومەر وتی: ئەنسار داوای فەرماندەیەکی بەتەمەنتر دەکەن. ئەبوبەکر کەدانیشتبوو، هەستا و ڕیشی عومەری گرت و وتی: کوڕی خەتاب، دایکت پرسەکەت نەبینێت، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردووە بەفەرماندە وتۆ بەمن دەڵێی ئەو لابەرم.

دواتر ئەبوبەکر هاتەدەر و ڕۆشتە لایان و ئەوانی ڕەوانە کرد. ئەو لای ئوسامە بەرێگادا دەڕۆشت و ئوسامە سوار و ئەبوبەکر پیادە. ئوسامە پێی وت: ئەی جێگری پێغەمبەری خوا، یا تۆ سوار دەبیت یا من پیادە دەبم. ئەبوبەکر پێی وت:

سوێند بەخوا نەتۆ دادەبەزیت نەمن سوار دەبم. بۆ من پێویستە کەمێك قاچەکانی خۆم لەرێگەی خوادا تۆزاوی بکەم. شەرکەر بۆ هەر هەنگاوێك کەهەڵیدەگرێت، حەوتسەد پاداشی پێدەبڕێت. هەروەها حەوتسەد پێگە و حەوتسەد گوناح لەو کەم دەبێتەوە.

کاتێك ویستی بگەڕێتەوە، بەئوسامەی وت: ئەگەر بتەوێت ئەتوانی، بەعومەر هاوکاری من بکەیت. ئوسامە فەرمانی بەعومەردا بگەڕێتەوە. دواتر ئەبوبەکر داوای لەسوپاکە کرد و وتی: خیانەت مەکەن، فێڵ مەکەن، دەست بۆ سامانی یەکتر مەبەن، گوێ و لوتی کەس مەبڕن، منداڵ، پیرە پیاو و پیرێژنەکان مەکوژن، باخی دارخورما کان مەبڕن و مەیسوتێنن، داری بەردار هەڵمەکەنن و مەڕ و وشتر و مانگا تەنیا بۆ خواردنی گۆشتەکەی سەر ببڕن. لەسەر رێگەی خۆتان رووبەڕووی خەڵکانێك دەبنەوە، پەنایان بردۆتە بەرماڵەکانی خۆیان و خۆیان تەرخان کردووە بۆ پەرەستینی خوا، رێگەیان پێبدەن، ئەوەی پێی دڵخۆشن، ئەنجامی بدەن. دووبارە لەسەر رێگەی خۆتان لای خەڵکانێکەوە تێدەپەڕن ناوەڕاستی مووی سەری خۆیان تاشیوە و ئەم لاولاکەیان بەرداوەتەوە. ئەوان بەشمشێر درووێنە بکەن. پەلە بکەن بەناوی خوا!

هەروەها بەئوسامەی وت ئەو کارە بکات کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوە. ئەو رۆشت و چەندین هۆزی لەخەڵکی قوزاعە کە لەدین هەڵگەڕابوونەوە، سەرکەوتکرد و تالآنی کردن و گەڕایەوە، رۆشتنی ئەو چل یا حەفتا رۆژی خایاند.

ڕەوانە کردنی سوپاکەی ئوسامە بەسودترین کار بوو بۆ موسوڵمانان، چوونکە عەرەبەکان وتیان: ئەگەر موسوڵمانەکان بەهێز نەبوونایە، ئەم سوپا گەورەیان ڕەوانە نەدەکرد. لەبەر ئەمە زۆربەی ئەو کارانەی دەیانویست ئەنجامی بدەن، لەبیریان کرد.

## هەواڵی کارەکانی ئەسوەد کوڕی عەنسی لەیەمەن

ناوی عەیهەلە کوڕی کەعب کوڕی عەوف عەنسی بوو. عەنس تایەفەیەك لەمەزجەحە. ئەویان بە(ڕوپۆش بەستوو) ناودەبرد چوونکە بەردەوام دەستارێکی لەسەر بوو وبەداوێنەکەی ڕوخساری خۆی دادەپۆشی.

کاتێك بازان باوەڕی بەئیسلام هێنا و لەگەڵ ئەو یەمانییەکان باوەڕیان هێنا، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانڕەوایی سەراسەری یەمەنی بەو سپارد و کردیە فەرمانڕەوای هەموو پانتاییەکانی ئەو ناوچەیە. ئەو کارگوزار و نوێنەری پێغەمبەر(د.خ) بوو تامرد. کاتێك بازان مرد، پێغەمبەر(د.خ) فەرماندارانی خۆی بۆ پانتاییە جۆراوجۆرەکانی یەمەن ڕەوانە کرد وئەوانی بەمشێوەیە دیاری کرد: عەمرۆ کوڕی حەزمی کردە فەرمانڕەوای نەجران، خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسی کردە فەرمانڕەوای نێوان زەبید و نەجران، عامر کوڕی شەهری کردە فەرمانڕەوای هەمدان، شەهر کوڕی بازانی کردە فەرمانڕەوای سەنعا ، یەعلی کوڕی ئومەییەی کردە فەرمانڕەوای جوند، تاهیر کوڕی ئەبی هالەی کردە فەرمانڕەوای عەك و ئەشعەرییەکان، زیاد کوڕی لوبەیدی ئەنساری کردە فەرمانڕەوای شارستانەکانی حەزەرمەوت، عوکاشە کوڕی سەوری کردە فەرمانڕەوای سەکاسێك و سەکون و موهاجیر یا عەبدوڵڵەی کردە فەرمانڕەوای مناڵەکانی معاویە کوڕی کەندە. مەعاز ئامۆژگارێك بوو لەپانتایی فەرمانڕەواکانی هەموو فەرمانڕەواییەکانی یەمەن وحەزەرمەوت دەسوڕایەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەجێگەدا کەوت، موهاجیر یا عەبدوڵڵە لەڕۆشتن خۆی دوورخستەوە تا ئەبوبەکر ئەوی ڕەوانە کرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، کارگوزارانی پێغەمبەر(د.خ) لەسەر یەمەن و حەزەرمەوت ئەم کەسانە بوون.

یەکەم کەسان کە لەبەرابەر ئەسوەد کوڕی عەنسی درۆزن خۆڕاگریان کرد، شەهر و فیروز و دادویە بوون. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەحەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە و لەڕێگادا نەخۆشکەوت (نەك ئەو نەخۆشییەی لەئازارەکەی مرد)، هەواڵی نەخۆشکەوتنی بەئەسوەد گەیشت و بانگەشەی پێغەمبەری کرد. پیاوێکی فێڵباز و

کاری سەیر و سەمەرەی دەکرد. مەزحەجییەکان شوێنی کەوتن و ئەمە یەکەم هەڵگەڕانەوە لەئایینی ئیسلام لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) بوو. ئەسوەد هێرشیکردە سەر نەجران و عەمرۆ کوڕی حەزم و خالید کوڕی سەعیدی لەوێ دەکرد. قەیس کوڕی عەبدی یەغوس کوڕی مەکشوح دژی فەروە کوڕی موسەیەك فەرمانداری موراد ڕاپەڕی و ئەوی دەرپەڕاند و خۆی لەجێگەکەی دانیشت. ئەسوەد لەنەجرانەوە ڕوویکردە سەنعا و شەهر کوڕی بازان ڕووبەڕووی بوویەوە. شەهر لەبیست و پێنجەمین شەوی هێرشەکەی ئەسوەد کوژرا. مەعاز هەڵات و خۆی گەیاندە ئەبو موسا فەرمانڕەوای مارب و ئەم دووانە پێکەوە هاتنە حەزەرمەوت. ئەو کەسانەی لەسەر ئایینی ئیسلام مابوونەوە، پەیوەستی فەروە بوون.

پاشایەتی وڵاتی یەمەن بۆ ئەسوەد سەقامگیر و فەرمانڕەواکانی یەمەن بەتاهیر کوڕی باوکی هالە پەیوەست بوون جگە لەعەمرۆ و خالید کەبۆ مەدینە گەڕانەوە. تاهیر لەکوێستانەکانی عەك و سەنعا بوو. ئەسوەد سەراسەری بیابانی تا حەزەرمەوت و لەوێوە تا تایف و بەحرەین و ئەحسا تا عەدەنی گرت. کاری ئەو وەك ئاگرکەوتنەوە، هەموو شوێنێکی گرتەوە. ئەو ڕۆژەی ڕووبەڕووی شەهر بوویەوە، جگە لەوشترسوارەکان حەوتسەد سوارەی لەگەڵدا بوو. فەرمانەکانی بەهێز و شوێنکەوتووانی زۆر بوون. جێگری ئەو لەمەزحەج، عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب و لەناو سوپاکەی قەیس کوڕی عەبد یەغوس بوو. ئێرانی نەژادەکان لەگەڵ فیروز و دادویە بوون.

ئەسوەد دوای کوشتنی شەهر بازان ژنەکەی ئەوی کردە هاوسەری خۆی. ئەم ژنە کچە پوری فیروز بوو. ئەو موسوڵمانانەی لەحەزەرمەوت بوون، ترسان ئەسوەد سوپایەکیان بکاتەسەر یا درۆزنێك هاوشێوەی ئەسوەد کوڕی عەنسی لەوێ دەرکەوێت. لەبەر ئەمە بۆ خۆی لەناو هۆزەکە هاوسەرێکی هەڵبژارد و خەڵکی سەکون شوێنیکەوتن. لەم کاتەدا نامەکانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەو و موسوڵمانەکانی یەمەن گەیشتە دەستیان. نامەکان فەرمانی بەواندەدا شەڕی ئەسوەد بکەن. مەعاز بەم کارە هەستا و موسڵمانان وڕەیان بەرز بوویەوە و هێزیان گرت. ئەو کەسەی نامەکانی پێغەمبەری هێنا، وەبر کوڕی یوحەنەسی ئەزدی بوو.

جەشنەسی دیلەمی دەڵێت: نامەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەدەستمان گەیشت و فەرمانمان پێدرا شەڕی ئەسوەد بکەین و چ بەشێوەی ڕووبەڕووبوونەوە یا چ بەشێوەی لەناکاو یا لەبێ ئاگاییدا لەناوی ببەین. دەڵێت نامەکان گەشتنە دەستی من و فیروز و دادویە. فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) ئەوە بوو کەلەگەڵ هەر کەسێك پێبەندی ئایین و دینە، نامە بگۆڕینەوە. ئەم کارەمان کرد و بینیمان ڕووبەڕووی کارێکی گران ودژوار بووینەوە. بینیمان قەیس کوڕی عەبد یەغوس تووڕە بووە و دڵی گۆڕاوە. وتمان: قەیس لەگیانی خۆی دەترسێت و وەڵامی یەکەم داوای ئێمە دەداتەوە. نامەمان بۆ نارد و پەیامەکەی پێغەمبەرمان پێراگەیاند. دەڵێی لەئاسمانەوە ڕۆشتبووینە لای کەبێدرەنگ وەڵامی ئێمە دایەوە و بەداواکەمان رازی بوو. دێو ماوەیەك دواتر ئەم هەواڵەی پێدا، ئەو قەیسی بانگ کرد و وتی دێو فەرمانم پێدەکات تۆ بکوژم چوونکە چوویتە پاڵ دوژمنەکانم. قەیس سوێندی بۆ خوارد و وتی: تۆ بەبڕوای من گەورەتری لەوەی گیانێك بۆ گیانەکان بێت یا بتوانم بیر لە ئاوا ئەندێشەیەك بکەمەوە. دواتر قەیس بۆ لای ئێمە گەڕایەوە و وتی: ئەی جەشنەس، فیروز، دادویە، ئەسوەد ئەمە و ئەوەی پێ وتم: لەهەمان کات کەسەرقاڵی گفتوگۆکردن بووین لەگەڵ ئەودا، لەناکاو پەیکی ئەسوەد گەشت و ئێمەی ترساند. ئێمە داوای لێبووردنمان کرد و خۆمان رزگار کرد بەڵام ئەوەندەی نەمابوو بکەوینە داوەکەی ئەو. ئەو گومانی لەئێمە دەکرد. لەم کاتەدا نامەکانی عامر کوڕی شەهر و زی زود و زی موڕان و زی کەلاع و زی زولەیم گەشتن و ئێمەیان ئاگادار کردەوە ئامادەن هاریکاریمان بکەن. ئێمە دەستمان بەنامنە گۆڕینەوە کرد و فەرمانمان پێدان هیچ کارێك نەکەن تا ئێمە کارەکانی خۆمان رێك بخەین. ئەوان لەبەر ئەوە کەوتنە خۆیان چوونکە پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ نەناردن. هەروەها نامەی بۆنەجرانییەکان نووسی و ئەوان وەڵامیان دایەوە. ئەم هەواڵە بەگوێی ئەسوەد گەیشت و تێگەیشت کەوتۆتە سەر هەڵدێری لەناوچوون.

دەڵێت: دوای ئەوە من ڕۆشتمە لای ژنەکەی ئەو کەدوای کوشتنی هاوسەرەکەی شەهر کوڕی بازان کردبوویە هاوسەری خۆی. داوام لێکرد لەم کارەدا هاریکاریم بکات، بیرم خستەوە کەئەسوەد هاوسەرەکەی کوشتووە، بنەماڵەکەی لەناو بردووە

و ژنەکانی ریسوا کردووە. وەڵامی داواکارییەکەی ئێمەی دایەوە و وتی: زیاتر لەهەموو ئافرێنراوانی خوا بەدوژمنی دەزانم، هیچ کام لەئایینە خواییەکان بەکار نابات و لەهیچ خراپەیەك خۆی دوورناخاتەوە. لەچۆنییەتی کارەکەتان ئاگادار بکەنەوە تا رێگەی راستتان نیشان بدەم. دەڵێت: من رۆشتمەدەر و فیروز و قەیس و دادویەم ئاگادار کردەوە. دەڵێت: سەرقاڵی ئەم کارە بووین لەناکاو پیاوێك هاتە لامان و داوای کرد قەیس بڕواتە لای ئەسوەد. قەیس رۆشتە ناو عەشیرە مەزجەح و هەمدان و ئەسوەد نەیتوانی بەبوونی ئەوان، بیکوژێت. ئەسوەد بەقەیسی وت: ناتەوێت راستی و دروستی لەگەڵ تۆ باس بکەم و تۆ درۆ لەگەڵ من دەکەیت؟ دێوەکەی من پێم دەڵێت: ئەگەر دەستی قەیس نەبڕیت، گەردنی تۆ دەبڕێت. قەیس وتی: ئەمە راستی و دروستی نییە من لەناو بچم و تۆ پێغەمبەری خوا بیت. هەر فەرمانێك دەتەوێت بیدە یا بمکوژە کەیەك مەرگ باشترە لەچەندین مەرگ. ئەسوەد دڵی بۆ قەیس سووتا و ئازادی کرد. قەیس هاتەدەر، لای ئێمە تێپەڕی و وتی: بەدوای کاری خۆتانا بڕۆن. ئەو لای ئێمە دانەنیشت. ئەسوەد لەگەڵ دەستەیەك هاتە لای ئێمە. ئێمە بۆ رێزگرتن لێی هەستاین و لەبەر دەرگایماڵەکەی ئێمە سەد سەر وشتر و گای لێبوو. ئەو، ئەوانی سەرِبڕی، بەجێی هێشتن و رۆشت. ئاوڕی دایەوە و وتی: ئەی فیروز، ئایا ئەوەی لەمن بەتۆ گەشتووە، راستە؟ (شمشێری بۆ لێدانی ئەو ئامادە کرد). من دەمویست تۆ سەر ببڕم. فیروز وتی: ئێمەت بەزاوایەتی خۆت هەڵبژارد و لەپێشیت پێ بەخشین، ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) نەدەبوویت، بەهرەی خۆمان بەهیچ شێوەیەك و لەبەرابەر هیچ مەبەستێك بەتۆ نەدەفرۆشت. ئێستا چۆنە، لەبەر ڕووناکی بوونی تۆ، کاری ئێمە لەم دنیا و لەو دنیا رێکخراوە! ئەسوەد پێی وت: ئەمانە دابەش بکە. ئەو دابەشیکردن و خۆی بەئەسوەد گەیاند و بینی پیاوێك لای ئەسوەد خراپەی ئەم باس دەکات و ئەو پێی دەڵێت: بەیانی فیروز و هاورێکانی کوشتار دەکەم. دووبارە سەیری کرد و فیروزی بینی کەئاگاداری کردەوە گۆشتەکانی دابەش کردووە. ئەسوەد رۆشت و فیروز گەڕایەوە و ئێمەی ئاگادار کردەوە. ئێمە کەسمان بەدوای قەیسدا نارد، قەیس هات و لەسەر ئەم بابەتە گفتوگۆمان کرد و بڕیارماندا من دووبارە بڕۆمە لای ژنەکەی و

لەمەبەستەکەی خۆمان ئاگاداری بکەینەوە و بۆچوونی ئەو وەربگرم و بزانم لەم کارەدا چی دەبینێت. ژن وتی: ئەو لەشوێنێکی ئارام و پارێزراو بەسەر دەبات و بەوردی کاروبارەکانی ئەنجام دەدات ولەزیان بەدوورە. پاسەوانەکان لەهەر لایەکەوە دەیپارێزن جگە لەم ماڵە کەپشتی لێرەو و لەوێیە و دەگاتە فلانە شوێن و فیسارە شوێن. کاتێک شەو داهات، دیوار یا زەوی هەڵکەنن کەلەپشت پاسەوانەکانەوە بگەنە ئەو و ئەوسا بۆ کوشتنی ئەو هیچ رێگرێک نابینن، لەو شوێنەی سەردەردێنن، چرا و شمشێرتان دەست دەکەوێت.

ئەسوەد منی بینی کاتێک لەیەکێک لەماڵەکانی ئەو دەهاتمەدەر. وتی: بۆچی هاتووی بۆ لای من؟ بەشێوەیەک لەسەریدام، کەوتمە سەر زەوی. ئەو پیاوێکی گەورە و چوارشانەبوو. ژن قیژاندی و پەرێشانی کرد و وتی: کورە مامەکەم هاتۆتە سەردانم وتۆ ئاوای لێدەکەیت! منی ئازاد کرد و گەرامەوە بۆ لای هاورێیانی خۆم و وتم: رابکەن،خۆتان رزگار کەن! بەسەرهاتەکەم بۆ گێرانەوە.

ئێمە لەم کارەدا سەرگەردان بووین کەپەیامی ئەو ژنەگەشت و وتی: ئەوەی لەسەری رێککەوتوین، بیرتان نەچێت، چوونکە ئەوەندە خۆشەویستیم نیشاندا، ئارام و ئاسودە بۆتەوە. بەفیروزم وت: برۆ لای ژنەکە و بپرسە ئایا کاروبارەکان بەپێی دڵخوازە یا نە. ئەو رۆشت و کاتێک لەگەڵ ژنەکە قسەی کرد، فیروز وتی: دەرۆینە دالآنێکی ژێرزەمین، هەڵیدەکەنین و لەماڵەکە سەردەردێنین. رۆشت و دەرگاکەی هەڵگرت و چاوی بەژنەکە کەوت. لەم کاتەدا ئەسوەد هاتە لای ژنەکە و تورە بوو. ژن ئاگاداری کردەوە کە لەگەڵ ئەم پیاوەدا شیری خواردوە و ئەو مەحرەمیەتی. ئەسوەد، فیروزی دەرکرد. کاتێک شەو داهات، کاری خۆمان دەستپێکرد و شوێنکەوتووانی خۆمان ئاگادار کردەوە. لەنامە ناردن بۆ هەمدانییەکان و حەمیرییەکان پەلەمان کرد. ئەوسا رێرەوی ژێرزەمینی ماڵەکەمان هەڵکەند و رۆشتین و چووینە ناو ماڵەکە. لەوێ چرایەکەی لێ بوو کەلەژێر کاسەیەکی گەورە دایان نابوو. ئێمە فیروزمان کردە قەڵغانی خۆمان چوونکە لەهەمووان بەهێزتر و گەورەتر بوو. پێمان وت بڕوانە بزانە چی دەبینێت. ئەو هاتەدەر و ئێمە لای ئەو وەک پاسەوانەکان بووین. کاتێک لەماڵەکە نزیککەوتەوە،

دەنگی مرخەی گەورەی پیاوێکی بیست و ژنەکەی بینی دانیشتووە. هەرئەوەندەی گەشتە بەر دەرگای ماڵەکە، دێو ئەسوەدی هەڵساند و قسەی هێنایە سەرزمان و وتی: فیروز، چ کارێکت بەمن هەیە؟ ترسا ئەگەر بگەڕێتەوە هەم خۆی لەناو بچێت هەم ئەو ژنە. پەلاماریدا و ئەسوەد لەوشترێکی گەورە و مەست دەچوو. فیروز گەردنی ئەوی شکاند وکوشتی، ئەوسا هەستا تا بێتەدەر. ژن داوێنی گرت چوونکە گومانی دەکرد ئەسوەدی نەکوشتووە. فیروز وتی: ئەوم کوشت و تۆم ئاسودە کرد. هاتەدەر و ئێمەی ئاگادار کردەوە. ئێمە ڕۆشتینە ناو و ئەسوەد وەك مانگا دەیزەڕاند. من سەریم بەکێرد بڕی. پاسەوانەکان ڕوویان لەو ماڵە کرد و بەردەوام دەیانوت: چی ڕوویداوە؟ ژن وتی: پێغەمبەر چاوڕوانی هاتنە خوارەوەی وەحییە! ئەوان ئارامبوونەوە و گەڕانەوە. ئێمە راوێژمان کرد و لەگەڵ فیروز و قەیس و دادویە گفتوگۆمانکرد کەچۆن لایەنگرانی خۆمان لەم کارە ئاگادار بکەینەوە. لەسەر ئەم ڕێککەوتین بەدەنگی بەرز جاڕ بدەین. کاتی بەرەبەیان بەدەنگی بەرز ئەو دروشمەمان وت کە لەسەری ڕێککەوتبووین. ئاباوەڕ و موسوڵمان هەردووك، پەشۆکان. هاوارمان کرد و من جاڕمدا: شایەتی دەدەم محەممەد پێغەمبەری خوایە و عەیهەلە درۆزنێکی درۆکەرە! سەری ئەسوەدمان خستە بەردەمیان. هاوڕێیان و پاسەوانەکانی ئەو گەمارۆیان داین و منالی زۆریان بەدیل گرت و تاڵانکردنیان دەست پێکرد. ئێمە خەڵکی سەنعامان ئاگادار کردەوە هەموو هاوڕێیان ئەسوەد لەوێ دەستگیر بکەن. ئەوان پەیك و پەیامیان بۆ ئێمە نارد و ئێمە بۆ ئەوان. لەسەر ئەوە ڕێککەوتین ئەوان ئەسیرەکانی ئێمە ئازاد بکەن و ئێمە ئەسیرەکانی ئەوان. ئێمە ئەو کارەمان کرد و ئەوان نەیانتوانی دەست بەسەر هیچ شتێکی ئێمەدا بگرن و لەنێوان سەنعا و نەجران هاتووچۆیان دەکرد. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە سەر کارەکانی خۆیان. مەعاز کوڕی جەبەل پێشنوێژی ئێمە بوو. ئێمە پێغەمبەرمان لەم کارە ئاگادار کردەوە وئەمە لەرۆژگاری ژیانی ئەودا بوو.

هەواڵ لەهەمان شەو بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت و کاتێك نێردراوانی ئێمە گەیشتنە مەدینە، بینییان پێغەمبەر(د.خ) مردووە. ئەبوبەکر وەڵامی پێویستی بۆ ئێمە نارد. عەبدوڵلە کوڕی عومەر دەڵێت: هەمان شەو کەئەسوەد کوژرا، هەواڵ

لەئاسمانەوە بۆ پێغەمبەر(د.خ) هات و ئەو فەرمووی: ئەسوەد کوژرا. پیاوێکی پیرۆز لەبنەماڵەیەکی پیرۆز ئەوی کوشت. پرسیان چ کەسێك ئەوی کوشت؟ فەرمووی: فیروز.

دەڵێن: کاری پێغەمبەری ئەسوەد عەنسی لەسەرەتا تا کۆتایی سێ یا چوار مانگ درێژەی کێشا. گەشتنی نێردراوان بۆ کوژرانی ئەو لەکۆتایی رەبیع ئەلئەوەل /٢٥ ژوئەنی ٦٣٢ زایینی دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) بوو. ئەمە یەکەم مژدە بوو لەمەدینە بەئەبوبەکر درا.

فیروز وتی: کاتێك ئەسوەدمان کوشت، بارودۆخ بۆ دۆخی جارانی گەڕایەوە. کەسمان بۆ لای مەعاز کوڕی جەبەل نارد و هات و بوو بەپێشنوێژی ئێمە. ئێمە دڵگەرم و هیوادار بووین و جگە لەسوارەکانی ئەسوەد نیگەرانی ترمان نەبوو و هەمووشتێك بەپێی خواستی دڵمان دەڕۆشتە پێش. لەناکاو هەواڵی مردنی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، زەوی لەرزی و هەموو کارەکان تێکچوون.

## ڕووداوەکانیتر

لەم ساڵەدا لەسێیەمی رەمەزان / ٢٢ نۆڤەمبەری ٦٣٢ زایینی فاتیمە کچی پێغەمبەر(د.خ) لەتەمەنی ٢٩ ساڵی، کۆچی دوایی کرد. دەستەیەك دەڵێن: سێ یا شەش مانگ دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) مرد. عەلی و ئەسما کچی عەمیس ئەویان شۆرد. عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب نوێژی لەسەر کرد عەباس و عەلی و فەزل کوڕی عەباس ڕۆشتنە ناو ئارامگاکەی.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی ئەبوبەکری سدیق مرد. کاتێك ئەو لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەتایف بوو، تیرێك بەرجەستەی کەوت لەلایەن باوکی مەحجنەوە. ئەو، نەخۆشکەوت و لەشەوالی ئەم ساڵە / دێسامبەری٦٣٢ زایینی کۆچی دوایی کرد. هەروەها لەم ساڵەدا لەو کاتەی خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ ئەبوبەکر بەست، یەزدگێردی سێیەم لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران دانیشت.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب کۆیلەکەی، ئەسلەمی لەمەککە لەدەستەیەك لەئەشعەرییەکان کڕیەوە.

## هەواڵی هەڵگەرانەوەی عەرەبەکان لەئایینی ئیسلام

عەبدوڵڵـە کـوڕی مەسـعود دەڵێـت: دوای مردنـی پێغەمبـەر(د.خ)، گرفتـاری ڕۆژگارێك بووین ئەوەندەی نەمابوو لەناوبچین تا ئەوەی خوا هاریکاری کردین و ئەبوبەکری پێبەخشین. ئەو لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵ ئێمە بەیعەتی بەست کەهیچ وشترێکی یەك ساڵە یا دوو ساڵە نەکوژین و دێهاتەکانی عەرەب وێران نەکەین و ئەوەندە خوا بپەرەستین تا دڵمان لێوانلێو دەبێت لەباوەڕ. دواتر خوا لەئەبوبەکر پەیمانی وەرگرت کێشەی هەڵگەڕاوەکان چارەسەر بکات. ئەو دەستبەرداری ئەوان نەبوو تا یەکێك لەم دوو ڕێگایە هەڵبـژێرن: بەرنامەیەکی ڕیسواکەر یا شەڕی ئاوارەکەر. بەرنامەی ڕیسواکەر ئەوە بوو رازی بن بەوەی کوژراوانی ئێمە لەبەهەشتن و کوژراوانی ئەوان لەدۆزەخ، خوێنبایی کوژراوانی ئێمە بدەن و ئەوەی ئێمە لەوان دەستمان دەکەوێت، بۆ خۆمان بێت بەڵام ئەوەی ئەوان لەئێمە دەستیان دەکەوێت، بۆمان بگەڕێننەوە. شەڕی ئاوارەکەر ئەوە بوو لەسەرزەمینەکانی خۆیان کۆچ بکەن.

هـەواڵی هەڵگەرانـەوەی عەرەبـەکان لـەئایینی ئیـسلام بەمـشێوە بـوو کاتێـك پێغەمبەر(د.خ) مرد و سوپای ئوسامە بەفەرمانی ئەبوبەکر ڕەوانە کرا، زەوی لەژێر پێی ئێمە ئاگریگرت و هەموو هۆزەکان بەشێوەیەکی گشتی لەدین هەڵگەڕانەوە جگـە لەقوڕەیـشییەکان و سـەقیفییەکان. کاروبـاری موسـەیلەمەی درۆزن و تولەیحەی درۆزن گەورە و خەڵکانی تەی و ئەسەد لەدەوری تولەیحە کۆبوونەوە. غەتەفانییـەکان شـوێن عوێەیینـە کـوڕی حـسن کـەوتن و لـەئایینی ئیـسلام هەڵگەڕانەوە. وتی: پێغەمبەرێك لەنێوان دوو هاوپەیمان (یانی ئەسەد و غەتەفان) باشترە لەپێغەمبەرێك لەقوڕەیشییەکان. محەممەد مردووە و تولەیحە زیندووە. لەبەر ئەمە غەتەفانییەکان شوێنیکەوتن. نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) کاتێك لای یەمانییەکان و ئەسەدییەکان و کەسانیتر گەڕانەوە کەئەو مردبوو و لەبەر ئەمە نامەکانی خۆیان بەئەبوبەکردا و لەهەواڵەکانی موسەیلەمە و تولەیحەیان ئاگاداریان کردەوە. ئەبوبەکر وتی: لێرە دوورمەکەونەوە تا ببینن نێردراوانی فەرماندەکانتان

لەگەڵ کەسانیتر، هاوڕێ لەگەڵ هەواڵی زۆر مەترسیدارتر لەوەی ئاماژەتان پێدا، بێن. بارودۆخ بەشێوەیەك ڕۆشتە پێش کەئەو پێشبینی کردبوو. زۆری نەخایاند نامەی فەرماندارەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەهەرلایەکەوە گەیشت و هەواڵیاندا عەرەبەکان راپەڕیون وپەیمانی ئیسلامیان شکاندووە و بەشێوەیەکی گشتی یا دەستە دەستە لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە و بەسەر موسوڵمانەکان زاڵبوون. ئەبوبەکر لەسەر هەمان بنەما شەڕی لەگەڵ دەکردن کەپێغەمبەر(د.خ) دەیکرد. پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان نارد. نێردراوانی ئەوان گەڕێنرانەوە و بەدوای نێردراوانی ئەوان نێردراوانیتر ڕەوانە کران. ئەو چاوەڕوانی کرد تا ئوسامە بگەڕێتەوە و شەڕ لەگەڵ ئەوان دەسپێبکات. فەرماندارانی پێغەمبەری خوا ئەمانە بوون: ئەمرۆئەلقەیس کوڕی ئەسبەغ کەلبی لەسەر کەلب و قوزاعە، عەمرۆ کوڕی حەکەم لەسەر قەین، معاویە والبی لەسەر سەعد کوڕی هوزیەم. وەدیعە کەلبی لەگەڵ دەوروبەرەکەی لەدین هەڵگەڕایەوە و ئەمرۆ ئەلقەیس لەسەر ئایینی ئیسلام مایەوە. زومەیل کوڕی قوتبەی قینی پشتی کردە ئایینی ئیسلام و عەمرۆ مایەوە. معاویە لەگەڵ شوێنکەوتووانی خۆی لەهۆزی سەعد هوزیەم ناباوەڕ بوون و پشتیان کردە دین. ئەبوبەکر نامەی بۆ ئەمرۆ ئەلقەیس نوسی کەباوەگەورێی سەکینە کچی ئیمام حسێن بوو. ئەو وەدیعەی بەعەمرۆ سپارد( کاری سەرکەوت کردنی وەدیعەی بەعەمرۆ کوڕی حەکەم سپارد) و لەناو زومەیل مایەوە تا کاری ئەوان تەواو بکات. هەروەها ئەبوبەکر بۆ معاویە عوزری نامەی نووسی و سوارەکانی ئوسامە ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی قوزاعە و هێرشیانکردە سەر ئەوان و سامانەکانیان تالأن کرد و تەندروست گەڕانەوە.

## گێڕانەوەی هەواڵی تولەیحەی ئەسەدی

تولەیحە کوڕی خویلدی ئەسەدی لەمناڵەکانی ئەسەد کوڕی خەزیمە لەرۆژگاری پێغەمبەردا خۆی بەپێغەمبەر ناوبرد. پێغەمبەر(د.خ) زورار کوڕی ئەزوری وەك فەرماندار نارده سەر مناڵەکانی ئەسەد و فەرمانی پێدا شەڕی ئەو کەسانە بکات کەلدین هەڵگەڕاونەتەوە. تولەیحە سستی لەخۆی نیشاندا وئەوەندەی نەمابوو لەناو بچێت. بەشمشێر لێیدا بەلاّم لێدانی شمشێرەکە کاریگەری بەجێنەهێشت. لەناو خەڵك بلاّو بوویەوە کەشمشێر کار لەو ناکات و لەم ڕێگاوە شوێنکەوتووانی زیادی کرد. پێغەمبەر(د.خ) مرد و ئەوان بەردەوام بوون. تولەیحە دەیوت: جبرەئیل لەلایەن خواوە پەیامم بۆ دەهێنێت. ئەو وتەی ئاهەنگدار و ودرۆینەی دروست کرد. بەشوێنکەوتووانی خۆی دەیوت لەنوێژدا کوڕنوش بردن و سوجدە بردن ئەنجام نەدەن. دەیوت: خوا پێی خۆش نییە ئێوە روخسار لەزەوی بدەن و قنتان بەشێوەیەکی ناشیرین بۆ ئاسمان بەرز بکەنەوە. بەشێوەی داوێنپاکی و ڕاوەستاو بیری خوا بکەنەوە. جگە لەمە، زۆر وتار و وتەیتری خستە سەر یەك. زۆربەی عەرەبەکان لەڕووی دەمارگیرییەوە شوێنیکەوتن و لەبەر ئەمە زیاتری شوێنکەوتونی لەئەسەد و غەتەفان و تەی بوون. غەتەفانییەکان و فەزارییەکان ڕۆشتنە باشوری تەیبە. خەڵکی تەی لەسنوری سەرزەمینەکانی خۆیان مانەوە، ئەسەدییەکان ڕوویانکردە سومەیرۀ ، عەبەس و سەعلەبە کوڕی سەعد و مورە لەئەبەرەق لەرەبەزە کۆبوونەوە و کەسانێك لەمناڵەکانی کەنانە پەیوەستیان بوون. ئەم سەرزەمینە فراوان نەبوو و لەبەر ئەمە بوون بەدوو دەستە. دەستەیەك لەئەبرەق مانەوە و دەستەیەك ڕوویانکردە زی قسە. تولەیحە حەبالی برای رەوانە کرد تا هاوکاریان بکات. ئەوبوو بەفەرمانڕەوایی ئەوان و هاوڕێکانیان لەدۆئێل و مودلیج و لەیس. ئەوان پەیکیان بۆ مەدینە نارد کەنوێژ دەخوێنن بەلاّم زەکات نادەن. ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر هەوساری وشترێك لەمن بشارنەوە، لەسەر ئەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەم. زەکات و خێراتی لەسەر ئەوان پێویست کرد وئەوانی گەڕاندەوە. دەستەی نوێنەرایەتی ئەوان بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان گەڕانەوە. ئەوان

هەواڵیاندا کەکەسانی ناو مەدینە لەموسوڵمانەکان کەمن و تەماحی هێرشکردنە سەر مەدینەیان لا دروستکردن.

ئەبوبەکر دوای ڕۆشتنی دەستەی نوێنەرایەتی، عەلی و زوبەیر و عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود و تەڵحەی لەسەر ڕێگا کوێستانییەکان دانا و خەڵکانی مەدینە لەترسی هێرشکردنی دوژمنان، لەمزگەوت کۆکردەوە چوونکە دوژمنان زۆر نزیکبوون. سێ شەویان تێپەڕنەکرد کەدوژمنان لەناکاو شەوانە هێرشیانکردە سەر مەدینە و بەشێك لەهێزەکانی وەك هێزی پشتیوان لەزی حوسەی هێشتەوە. شەوانە گەشتنە ڕێگە کوێستانییەکان وبینیان شەڕکەران ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەن. ئەوان پاشەکشێیان بەدوژمنان کرد و شوێنیان کەوتن و ئەم هەواڵەیان بەئەبوبەکر ڕاگەیاند. ئەو و هاورێکانی سوار لەسەر وشترە ئاوهەڵگرەکان ڕۆشتنە لای کەسانی ناو مزگەوت و پاشەکشێیان بەدوژمن کرد وتا زوی حوسەی شوێنیان کەوتن. هێزی پشتیوانی دوژمن بەمەشکەی گەورەی پڕخۆڵ کەتلێریان کردەوە، ڕووبەڕووی موسوڵمانان بوونەوە. وشترەکانی موسوڵمانان ڕەمیان کرد. وشترەکان موسوڵمانانی بۆ مەدینە گەڕاندەوە، بەڵام کەسیان نەکوژرا.

ناباوەڕان گومانیان دەکرد موسوڵمانان کەم و لاوازن. ئەوان دانیشتووانی زی قوسەیان ئاگادار کردەوە و ئەوانیش پەیوەستیان بوون. ئەبوبەکر دەستی بەکۆکردنەوەی خەڵك کرد و بۆ ڕێکخستنی ئەم کارە بەردەوام هاتووچۆی دەکرد. لەباڵی ڕاست نەعمان کوڕی موقرینی دانا، لەباڵی چەپ عەبدوڵڵە کوڕی موقرین و لەکۆتایی سوپا سوەید کوڕی موقرین. بەرەبەیان هەڵنەهاتبوو کەئەوان لەگەڵ دوژمن لەیەك گۆڕەپاندا بوون. هەر ئەوەندەی چاوی موسوڵمانان بەوان کەوت، شمشێریان خستە ناویان و هێشتا خۆر ئاوا نەببوو ناچاریان کردن گۆڕەپان بەجێ بێڵن و ڕابکەن. موسوڵمانان بەسەر ئەواندا زاڵبوون و چەندین پیاو لەم ناوەدا کوژرا. ئەبوبەکر شوێنیان کەوت تا گەشتە زی قوسەی. ئەمە یەکەم سەرکەوتن بوو. لەوێ نەعمان کوڕی موقرینی هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاکە دانا و بۆ مەدینە گەڕایەوە. بتپەرستەکان ملکەچی بوون. لەم کاتەدا منداڵەکانی عەبەس و منداڵەکانی زوبیان، دژی ئەو موسوڵمانانەی لەناویاندا بوون، ڕاپەڕین ولەناویان بردن.

ئەبوبەکر سوێندی خوارد، بیٚ گومان بەهەمان ئەندازە کە لەموسوڵمانان کوژراوە، لەبتپەرستەکان دەکوژێت. بەهێزی و خۆراگری موسوڵمانان زیادی کرد.

لەم کاتەدا زەکات وخێرات لەلایەن ئەو کەسانەی بۆ وەرگرتنی نێردرابوون، گەشتە مەدینە کەلەناویاندا سەفوان و زەبیرقان کوڕی بەدر و عودەی کوڕی حاتم بوون. لەم کاتەدا شەست ڕۆژ بەسەر ڕۆشتنی ئوسامە تێپەری کردبوو. ئوسامە چەند ڕۆژ دوای ئەوە گەڕایەوە. دەستەیەك دەڵێن: شەڕ و گەڕانەوەی ئەو چل ڕۆژی خایاند. کاتێك ئوسامە بۆ مەدینە گەڕایەوە، ئەبوبەکر، ئەو و سوپاکەی لەم شارەدا نیشتەجیٚ کرد تا بحەوێنەوە و ئەسپەکانیان وچان بدەن. دواتر لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی ڕۆشتەدەر. موسوڵمانان سوێندیاندا خۆی لەمەدینە بمێنێتەوە وکەسانیتر بنێرێت بەلاّم رازی نەبوو و وتی: خۆم لەئێوە بەباشتر نازانم و لەپێشی بۆ خۆم لەبەرچاو ناگرم. ئەو تا زی حوسەی و زی قوسەی ئەسپی غاردا و لەئەبەرەق دابەزی و شەڕی لەگەڵ دانیشتوانی ئەویٚ کرد. خواوەند بتپەرستەکانی شکەستدا و ئەو (خەتەبەی) بەئەسیری گرت. عەبەس و منالّەکانی بەکر هەلاّتن وئەبوبەکر چەند ڕۆژێك لەئەبەرەق مایەوە. دەستی بەسەر منالّەکانی زوبیان وسەرزەمینی ئەواندا گرت و بۆ چوارپێکان و خێراتی موسوڵمانان بەکاریبرد.

کاتێك عەبەس و زوبیان شکەستیان خوارد، بۆ لای تولەیحە گەڕانەوە و ئەو لەبوزاحە بوو. تولەیحە لەسومەیراوە هاتبووە ئەویٚ و تیایدا نیشتەجیٚ ببوو. ئەبوبەکر گەڕایەوە بۆ مەدینە. کاتێك ئوسامە و سوپاکەی حەوانەوە ( و لەم کاتەدا زەکات و خێریکی فراوان گەشتبووە مەدینە) ئەبوبەکر سوپاکەی ڕەوانە کرد و ئالاّی بۆ بەستن. ئەویانزە ئالاّی هەڵکرد: ئالاّیەکی بۆ خالید کوڕی وەلید بەست و فەرمانی پێدا بڕواتە شەڕی تولەیحە کوڕی خوەیلد و کاتێك لەو تەواو بوو، بڕواتە شەڕی مالك کوڕی نوەیرە لەبوتاح. ئالاّیەکیتر بۆ عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل بەست و فەرمانی پێدا هێرش بکاتەسەر موسەیلەمەی درۆزن. هەروەها بۆ موهاجیر کوڕی ئەبی ئومەییە ئالاّیەکی بەست و فەرمانی پێدا لەشکرەکەی ئەسوەد کوڕی عەنسی سەرکوت بکات و لەبەرابەر قەیس کوڕی مەکشوح هاریکاری ئێرانییەکان بکات و دواتر بەرەو سەزەمینی کەندە لەحەزەرمەوت بڕوات. ئالاّیەکیتری بۆ خالید کوڕی

سەعید هەڵکرد و ئەوی بەرەو بەرزاییەکانی شام ڕەوانە کرد. ئالآیەکی بۆ عەمرۆ کوڕی عاس هەڵکرد وبەرەو قوزاعەی نارد. ئالآیەکیتری دایە دەست حوزەیفە کوڕی موحسینی غەتەفانی تا بڕواتە شەڕی دانیشتووانی دەبا. ئالآیەکی بۆ عەرەفجە کوڕی هەرسیمە بەست و لەگەڵ مەهرە فەرمانی پێدان تا کۆببنەوە هەرکام سوپاکەی خۆی فەرماندەیی بکات. ئالآیەکی بۆ شورەحبیل کوڕی حەسەنە هەڵکرد و بەدوای عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل ڕەوانەی کرد و وتی: کاتێك ئەو لەیەمامە کارەکانی تەواو بوو، تۆ ڕووبکەرە قوزاعە و فەرماندەی سوارەکانی خۆتبە و شەڕی ئەو لەدین هەڵگەڕاەکان بکە، ئالآیەکی دایەدەست مەعن کوڕی حاجز و فەرمانی شەڕ کردن لەگەڵ مناڵەکانی سولەیم و هاورێکانیانی لەهوازین پێدا. ئالآیەکی بۆ سوەید کوڕی موقرین بەست و بەرەو تەهامە لەیەمەن ڕەوانەی کرد. ئالآیەکی بۆ عەلا کوڕی حەزرەمی بەست و ڕەوانەی بەحرەینی کرد. فەرماندەکانی دەستە شەڕکەرەکان لەزی قوسەی ڕەوانە بوون و هەر سوپایەك پەیوەستی فەرماندەکەی خۆی بوو. پێشنیارە پێویستەکان بەهەر فەرماندەیەك درا و بۆ هەموو هەڵگەڕاوەکان لەدین نوسخەیەکی لەفەرمانەکانی خۆی نارد و پێشنیاریکرد بگەڕێنەوە سەر ئاینی ئیسلام و بەتوندی ئەوانی ئاگادار کردەوە. نامەی بەنێردراوە تایبەتییەکانی خۆی نارد. کاتێك عەبەس و زوبیان شکستیان خوارد و لەبوزاحە پەیوەستی تولەیحە بوون، کەسی بۆ لای غەوس و جەدیلە لەتەی ڕەوانە کرد و فەرمانیدا، تا پەیوەستی ببن. دەستەیەك لەخەڵك پەیوەستی بوون و فەرمانیان بەخەڵکدا پەیوەستی ببن هەموویان لای تولەیحە کۆببوونەوە.

ئەبوبەکر پێش خالید کوڕی وەلید عودەی کوڕی حاتەمی ڕەوانەی تەی کرد و دواتر خالیدی بەدوایدا نارد و فەرمانی پێدا بوو، لەسەرزەمینی تەی دەست پێبکات و لەوێوە بڕواتە بوزاحە و دواتر بەرەو سێیەم جێگە بڕوات و کاتێك دەستەیەك لەخەڵکی ملکەچ کرد، لای بمێنێتەوە تا فەرمانی پێدەگات. ئەبوبەکر وای نیشاندا دەیەوێت بەرەو خەیبەر بڕوات و هێرش بکاتەسەر ئەویّ و دواتر پەیوەستی خالید ببێت. مەبەستەکەی لەوە بوو بەمشێوەیە ترس بخاتە دڵی دژومنەکانی.

عودەی ڕۆشتە لای خەڵکانی تەی و داوای لێکرد بگەڕێنەوەسەر ئایینی ئیسلام و ئاگاداری کردنەوە.

ئەوان ڕازی بوون و وتیان: ڕووبکەرە سوپاکەی خۆت و لەئێمەی دوورکەرەوە تا کەسانی خۆمان لای تولەیحە بانگ بکەین نەکا ئەوان کوشتار بکات. عودەی ڕوویکردە خالید و ئەم هەواڵەی پێدا. خەڵکانی تەی پەیك و پەیامیان بۆ لای براکانیان نارد کە لەسوپاکەی تولەیحەدا بوون و ئەوان پەیوەستی ئەمان بوون. لەبەر ئەمە دانیشتووانی تەی، وەك موسوڵمان بۆ لای خالید گەڕانەوە. خالید ڕۆشت تا خۆی گەیاندە جەدیلە بەڵام عودەی داوای لێکرد چاوەڕێ بێت و بۆ ماوییەك لەهێرشکردنە سەر ئەوان خۆبپارێزێت. عودەی ڕۆشتە لایان و داوای لێکردن بگەڕێنەوە سەر ئایینی ئیسلام، ئەوان ڕازی بوون. ئەوانی موسوڵمان هێنایە لای خالید. لەناو ئەوان هەزار سوارە پەیوەستی سوپاکەی خالید بوون. بەم شێوە بوو عودەی کوڕی حاتەم بووبەباشترین خەڵکی سەرزەمینەکەی و پیرۆزترینیان.

خالید کوڕی وەلید، عوکاشە کوڕی میحسەن و سابت کوڕی ئەقرەمی ئەنساری وەك پێشەنگی خۆی ڕەوانە کرد تا حەبال برای تولەیحەیان گرت و کوشتیان. ئەم هەواڵە بەتولەیحە گەیشت، ئەو لەگەڵ براکەی سەلمە هاتەدەر، ئەو عوکاشەی کوشت لەگەڵ براکەی سابت. دواتر گەڕانەوە.

خالید و سوپاکە گەیشتن و عوکاشە و سابتیان بەکوژراو بینی. موسوڵمانان لەم کارە پەرێشان بوون و شینیان کرد. خالید لەگەڵ ئەوان ڕۆشتە سەرزەمینی تەی. دانیشتووانی تەی وتیان: ئێمە قەیسیەکان لەناو دەبەین ومناڵەکانی ئەسەد هاوپەیمانی ئێمەن. وتی: لەگەڵ هەرکام لەم دوو تایەفە دەتانەوێت، شەڕ بکەن. عودەی کوڕی حاتەم وتی: ئەگەر ئەم پیاوە، بڕواتە لای نزیکترین کەسی بنەماڵەکەی من، لەسەر پەرەستینی خوا شەڕی لەگەڵ دەکەم. سوێند بەخوا لەبەر هاوپەیمانی لەگەڵ مناڵەکانی ئەسەد لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەوان پاشەکشێ ناکەم. خالید پێی وت: شەر لەگەڵ هەرکام لەم دوودەستە، شەرە لەڕێگای خوا، دژایەتی بۆچون و ئەندێشەی هاورێکانت مەکە بەڵکو لەگەڵ ئەوان ڕەوانەی شەڕی ئەو

کەسانە بە کەئەمان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان ئامادەترن. دواتر خۆت بۆ شەڕی ئەوانیتر ئامادە بکە. ڕۆشت و هەردووکیان لەبوزاحە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، منداڵەکانی عامر لەنزیکی ئەوان بوون و چاوەڕوانی ئەنجامی کارەکە بوون تا بزانن ئاشی شەڕ لەزیانی کامیان دەسوڕێت. خەڵك لەبوزاحە شەڕیان کرد.

عۆیەیینە کوڕی حسن لەگەڵ حەوتسەد سوار لەناو سوپاکەی تولەیحەدا بوو. ئەوان بەسەختی شەڕیان کرد و تولەیحە خۆی لەعاباکەیەوە ئاڵاندبوو و پێشگویی و پێغەمبەری بۆ دەکردن. کاتێك شەڕەکە دژوار بوو، عۆیەیینە ڕوویکردە تولەیحە و وتی: ئایا تا ئێستا جبرەئیل هاتۆتە لای تۆ؟ وتی: نە.عۆیەیینە گەڕایەوە و شەڕی دەست پێکرد و دووبارە گەڕایەوە بۆ لای تولەیحە وتی: ئەی بێ باوك! ئایا هێشتا جبرەئیل نەهاتووە؟ وتی: نە. عۆیەیینە وتی: تا کەی. سوێند بەخوا گیانمان هاتۆتە سەر لێومان. گەڕایەوە و دەستی بەشەڕ کردن کردەوە و دواتر هاتەوە لای تولەیحە و وتی:جبرەئیل نەهات؟ وتی: بەڵێ. وتی: چی پێ وتی؟ تولەیحە وەڵامی دایەوە: تۆ ئاشێکت دەبێت هاوشێوەی ئەو و ڕۆژێك کەنەتوانی لەبیری بکەیت. عۆیەیینە وتی: ئەی منداڵەکانی فەزارە، پاشەکشێ بکەن چوونکەئەو درۆزنێکی درۆکەرە. خەڵك گەڕانەوە و ئەوان شکستیان خوارد.

تولەیحە ئەسپ و ماینەکەی خۆی بۆ ژنەکەی (نەوار) ئامادە کردبوو. کاتێك ئەویان گەمارۆدا، پەڕییە سەر ئەسپەکەی خۆی، هاوسەرەکەی هەڵگرت و هەڵات و وتی: ئەی دەستەی فەزاریەیکان، هەر کەس دەتوانێت ئەم کارە بکات و هاوسەرەکەی خۆی رزگار بکات، خێراکەن. ڕایکرد و ڕۆشتە شام. دواتر ڕۆشتە لای کەلب و کاتێك بیستی ئەسەد و غەتەفان باوەڕیان هێناوە، باوەڕی هێنا و لەناو کەلبدا مایەوە تا ئەبوبەکر مرد.

ئەو لەرۆژگاری خەلافەتی ئەبوبەکر بۆ حەجی عەمرە ڕۆشتەدەر و لەقەراغەکانی مەدینەوە گوزەری کرد. بەئەبوبەکریان وتی: ئەوە تولەیحەیە! وتی: دەتوانم چی لێ بکەم؟ ئەو باوەڕی هێناوە و ئازاد و ئاسودەیە. کاتێك عومەر هاتەسەر کار، تولەیحە ڕۆشت و بەیعەتی لەگەڵ بەست. عومەر وتی: تۆ کوژەری عوکاشە و سابیت؟ سوێند بەخوا هەرگیز تۆم خۆش ناوێت.

تولەیحە وتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانەکان، تۆ کارت بەو دوو پیاوە گەورە چییە کەخوا لەسەر دەستی من بەهەشتی بەرینی بەوان بەخشی و منی لەسەر دەستی ئەوان ڕەوانەی دۆزەخ نەکرد! عومەر بەیعەتی لەگەڵ کرد و لێی پرسی: ئایا لەدینی پێشوت هیچت بۆ ماوەتەوە؟. وتی: یەك یا دووجار فوتێکردن بەئامێری ئاگر خۆش کردنی ئاسنگەران. دواتر گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی و لەناو ئەواندا مایەوە تا بەرەو عێراق ڕەوانە بوو.

کاتێك خەڵك لەدەوری تولەیحە بڵاوەیان لێکرد، عوێەیینە کوڕی حسن ئەسیر کرا و بردیانە لای ئەبوبەکر. قۆڵی ئەویان بەستبوو و منالآنی مەدینە پێیان دەوت: ئەی دوژمنی خوا، ئایا دوای باوەڕ ڕووتکردە ناباوەڕی؟ ئەو دەیوت: سوێند بەخوا بۆ یەك چاوتروکانیش باوەڕم بەخوا نەهێناوە. ئەبوبەکر لێی خۆش بوو و خوێنەکەی پاراست.

لەناو هاوەڵانی تولەیحە یەکیان گرت کەلەدینەکەی ئەو ئاگادار بوو. خالید وتی تولەیحە چی بۆ باس دەکردن؟ ئەو پیاوە وتی: ئەوەی وەك پەیامی خوایی باسی دەکرد ئەمە بوو: سوێند بەکۆتری ماڵی لەسەر بان و قرپۆکی خەرامان، تەمەنتان درێژ دەبێت بەدڵخواز و فراوان دەبێت پاشایەتی ئێمە بۆ عێراق و شام.

دەڵێت: لەوان کەس بەئەسیری نەگیرا چوونکە زۆر بەبەهێزی بنەماڵەکانی خۆیان دەپاراست. کاتێك شکستیان خوارد، لەناو ژن و منالەکانی خۆیان سەری کوڕنوشیان بۆ ئیسلام دانەواند و ئەبوبەکر ئەوانی ئازاد و ئاسودە کرد.

## هەڵگەڕانەوەی مناڵەکانی عامر و هوازین و سولەیم لەئایینی ئیسلام

مناڵەکانی عامر لەرێگەی هەڵگەڕانەوە لەدین هەنگاوێکیان بۆ پێشەوە دەبرد و هەنگاوێکی بۆ دواوە. سەیری ئەسەد و غەتەفانییان دەکرد. ئەوسا ئەسەد و غەتەفان گەمارۆدران وسەرکوتکران و مناڵەکانی عامر شوێنکەوتووی گەورەکان و سەروەرانی خۆیان بوون. قورت کوڕی هوبەیرە لەناو کەعبدا بوو و عەلقەمە کوڕی عولاسە لەناو کەلاب. ئەو باوەڕی هێنا و دواتر لەکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەدین هەڵگەڕایەوە و دوای گرتنی تایف ڕوویکردە شام. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، بەپەلە هات و لەناو مناڵەکانی کەعب لەشکرگەیەکی دروست کرد. ئەم هەواڵە بەگوێی ئەبوبەکر گەیشت وئەو سوپایەکی کردەسەری کەفەرماندەکەی قەعقاع کوڕی عەمرۆ بوو. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو قەعقاع کوڕی سور فەرماندە بوو. ئەبوبەکر فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر عەلقەمە یا گرفتاری بکات یا بیکوژێت. قەعقاع ڕۆشت و هێرشیکردە سەر ئەو ئاوەی عەلقەمە لەسەری بوو. ئەو بەردەوام ئامادە دەژیا. پەڕییە سەر ئەسپەکەی خۆی و غاریدا و پێش ئەوان کەوتەوە و خۆی ڕزگار کرد. کەسان و ژن و مناڵەکەی باوەڕیان هێنا و قەعقاع ئەوانی گرت و بردییە لای ئەبوبەکر. ئەوان وتیان لایەنگری لەعەلقەمە ناکەن. هەروەها هەواڵ بەئەبوبەکر نەگەیشتبوو کەئەوان سەرزەمینەکەی خۆیان ڕەها کردبێت. وتیان: گوناحی ئێمە چییە عەلقەمە ئەم کارانەی کردووە؟ ئەبوبەکر ئەوانی ئازاد کرد و بەدوای ئەوە عەلقەمە باوڕی هێنا و بەباوەڕ هێنانەکەی ڕازی بوون.

دوای شکان دانیشتوانی بوزاحە و مناڵەکانی عامر پێکەوە ڕاوێژیان کرد و وتیان: باوەڕ بەو شتە دێنین کەلێی هەڵگەڕاینەوە. باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی دێنین. ئەوان ڕۆشتنە لای خالید و خالید لەسەر هەمان بنەما بەیعەتی لەگەڵ بەستن کەلەگەڵ دانیشتووانی بوزاحە بەیعەتی بەست. ئەوان لەسەر بنەمای پێبەند بوون بەئیسلام بەیعەتیاندا. ئەو وتاری لەکاتی بەیعەتی لەوانی دەبیست ئەمە بوو:

پەیمانِ و پەیوەندی خوایی لەئەستۆی ئێوەدایە کەبێ گومان بەشێوەیەکی بەهێز و لەدڵەوە باوەڕ بەخوا وپێغەمبەرەکەی دێنن و بێ چەند و چون نوێژ دەخوێنن وبێ چەند و چون زەکات دەدەن و لەسەر ئەم بنەمایە لەژن و منالەکانتان بەیعەت وەردەگرن. دەیانوت: راستە. لەئەسەد و غەتەفان و تەی و سولەیم و عامر تەنیا بەوە رازی بوو کەئەو کەسانە بێنن کەلەکاتی هەڵگەڕانەوە لەدین، ئاگریان لەخەڵك بەردابوو، لوت و گوێچکەیان بڕیبوو و جوێنیان بەئیسلامدابوو. ئەوانیان هێنا. خالید گوێ و لوتی ئەوانی بڕی، ئاگری لەوان بەردا و بەردبارانی کردن و لەبەرزایی کوێستانەکانەوە فڕیدانەخوار و لەچاڵەکان سەرەو خوار هەڵیواسین. دواتر کەسی بۆ لای ئەبوبەکر نارد و ئاگاداری کردەوە کەچی کردووە. ئەو قورەت کوڕی هوبەیرەی لەگەڵ چەند کەسێك، قۆل بەستراو ناردە لای ئەبوبەکر و زوهەیریشی ڕەوانە کرد.

داستانی دایکی زمل بەمشێوە بوو کەهەلآتووانی غەتەفان و تەی و سولەیم و هوازین و کەسانیتر لەدەوری زمل سەلما کچی مالك کوڕی حوزەیفە کوڕی بەدر کۆبوونەوە. دایکی ئەو دایکی قرفە کچی ڕەبیعە کوڕی بەدر بوو. دایکی زمل لەرۆژگاری دایکی قرفە ئەسیر کرابوو. ئەو بەعایشە بڕا کەئازادی کرد و دایکی زمل بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە و لەدین هەڵگەڕایەوە و دەستەی هەلآتووان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو فەرمانی شەڕی بەواندا و شوێنکەوتووانی زۆر بوون و شکۆیەکی تایبەتی پێبڕا. کاتێك ئەم هەواڵە بەخالید گەیشت، بۆ جەنگی ئەو ڕۆشت. لەیەکەم رۆژ شەڕێکی قورس ڕوویدا و ئەو سوار لەسەر وشتری دایکی خۆی و بەیاسا و شکۆی تایبەتی خۆی، وەستابوو. سوارەکان دەوری وشترەکی ئەویان گرت و موسوڵمانان وشترەکەی ئەویان کوشت. لەدەوری ئەو سەد پیاو کوژرا. هەواڵی سەرکەوتنیان بەئەبوبەکر گەیاند.

بەلآم چارەنوسی فوجائەی سولەمی (ناوی ئەیاس کوڕی عەبد یالەیل بوو) بەمشێوە بوو کەهاتە لای ئەبوبەکر و وتی: شمشێرم پێبدە تا لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان لەدین شەڕ بکەم. ئەبوبەکر شمشێری پێدا و فەرماندەیی پێبەخشی بەلآم ئەو پشتی کردە موسوڵمانەکان و ڕۆشت تا لە(جوء ) دابەزی. ئەو نوخەبە کوڕی ئەبی

مەیسای لەمناڵەکانی شەرید ڕەوانە کرد و فەرمانی شەڕی لەگەڵ موسوڵمانان پێدا. ئەو لەنێوان سولەیم و عامر و هوازین هێرشیکردە سەر یەك یەکی موسوڵمانان. ئەم هەواڵە بەئەبوبەکرگەیشت و ئەو کەسی بۆ لای تورەیفە کوڕی حاجر نارد و فەرمانی پێدا بڕواتە شەڕی فوجائەی سولەمی، سوپا کۆبکاتەوە و هێرش بکاتەسەری. عەبدوڵڵە کوڕی قەیسی حاشی وەك هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد کەهەردووك دەستیان بەگەڕان بەدوای ئەودا کرد و فوجائە بۆ پەناگا هەڵات. ئەم دووانە لەجەوء ڕووبەڕووی بوونەوە. نوخەبە کوژرا و فوجائە هەڵات. تورەیفە خۆی پێگەیاند و بەدیل گرتی و ناردی بۆ لای ئەبوبەکر. کاتێك گەشتە لای ئەبوبەکر، فەرمووی لەنوێژگەی مەدینە ئاگرێکیان داگیرساند و ئەویان بەدەست وپێی بەستراو خستە ناو ئاگرەکە.

بەلاّم بەسەرهاتی ئەبوشەجەرە کوڕی عەبدولعوزا سولەمی بەمشێوە بووکە لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان لەدینی ئیسلام هەڵگەڕایەوە. دەستەیەك لەوان وەك مەعن کوڕی حاجر(یەکێك لەفەرماندەکانی ئەبوبەکر) لەسەر دینەکەی خۆیان مانەوە. کاتێك خالید ڕۆشتە شەڕی تەڵحە، بۆ مەعن کوڕی حاجزی نووسی لەگەڵ باوەڕدارانی هاوڕێی لەمناڵەکانی سولەیم پەیوەستی ببێت. ئەو ڕۆشت و مامەی تورەیفەی وەك جێگری خۆی لەسەر کاروبارەکان دانا. کاتێك ئەبوشەجەرە لەدین هەڵگەڕایەوە، ئەمەی وت:

سحا القلب عن مي هوهو اقصرا      وطاوع فيها العاذلين فابصرا

الا ايها المدلی بكثرة قومه      وحظك منهم ان تضام و تقهرا

سل الناس عنا كل يوم كريهة      اذا ما التقينا دارعين و حسرا

السنا نعاطی ذا الطماح لجامه      ونطعن في الهيجا اذا الموت اقفرا

فرويت رمحی من كتيبة خالد      و انی لارجو بعدها ان اعمرا

واتاکەی: دڵ لەخۆشەویستی (مەیە) هاتەهۆش و چاوپۆشیکرد، لەم ڕێگادا وتاری سەرکۆنەکەرانی بیست و ڕووی کردە بینایی و [illegible] ئەو کەسەی خۆت بەزۆری خەڵکەکەت هەڵدەواسی و شانازی دەکەیت وگومان ناکەیت بەهرەیەك کەلەوان دەستت دەکەوێت، جگە لەستەم و سەرکوت نییە. لەخەڵك سەبارەت

بەپیاوەتی ئێمە لەهەر شەڕێك بپرسە کەکاتێك زرێپۆش یابەڕووتی، ڕووبکەینە شەڕ، چ هونەرێك لەخۆمان نیشان دەدەین. نا ئێمە ئەو کەسانەین یاخیان و شانازیکەران هەوسار دەکەین و لەشەڕە سەختەکان کەمەرگ ڕوودەکاتە دەشت، گورزە قورسەکان دەوەشێنین. ڕمەکەی خۆم لەخوێنی لەشکرەکەی خالید بەفراوانی تێراو کرد و هیوادارم دوای ئەوە ڕۆژگارێك درێژ بمێنەوە و زیندوو بم.

دواتر ئەبوشەجەرە باوەڕی هێنا. کاتێك ڕۆژگاری عومەر گەیشت، هاتە مەدینە و بینی ئەو بەهەژارەکان زێر و مەبەستەکانیان دەهێنێتەدی. وتی: لەمنیش خۆشبە کەنیازمەندم. عومەر وتی: کێیت؟ وتی: ئەبوشەجەرە کوڕی عەبدولعوزای سولەمیم. عومەر وتی: ئەی دوژمنی خوا، سوێند بەخوا هیچ بەتۆ نابەخشم. تۆ مەگەر ئەوە نیت کەوتت:

فرويت رمحى فى كتيبة خالد        و انى لارجو بعدها ان اعمرا

عومەر بەردەوام بەقامچی لیّ دا تا بەرەو وشترەکەی ڕایکرد و سوار بوو، ڕۆشتە لای خەڵکەکەی و وتی:

ضن علينا ابو حفص بنائله        و كل مختبط يوما له ورق

واتاکەی: ئەبوحەفس بەخشینەکانی خۆی لەئێمە درێغ کرد لەگەڵ ئەوەی هەر داواکارێکی نەناسراوی بێ نێوەنجیگەر ڕۆژێك لەڕۆژان زێر و مەبەستەکەی پێدەبەخشن.

## گەڕانەوەی عەمرۆ کوڕی عاس لەعەممان

پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی گەڕانەوە لەحەجیماڵئاوایی عەمرۆ کوڕی عاسی بۆجەیفەر ناردبوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەو لەعەممان بوو. ئەو گەڕایەوە و لەبەحرەینەوە تێپەڕی و بینی مونزەر کوڕی ساوی لەلێواری مەرگدایە. دواتر لای ئەو ڕۆشت و گەشتە سەرزەمینی منداڵەکانی عامر و بووە میوانی قورە کوڕی هوبەیرە. قورە هەنگاوێکی بۆ پێش دەنا و هەنگاوێك بۆ دوا و چەندین کەس لەسوپاکەی منداڵەکانی عامر لەگەڵ ئەودا بوون. قورە مەڕێکی بۆ سەربڕی و ڕێزی لێگرت. کاتێك ویستی بڕوات، قورە قسەی دڵی خۆی کرد و وتی: ئەی پیاو، عەرەبەکان پێیان خۆش نییە باجیان لێ بستێنن. ئەگەر ئەوان ببەخشن، گوێ لەقسەکانی ئێوە دەگرن و فەرمانەکانتان جێبەجێ دەکەن. ئەگەر پێداگری بکەن، لەدەوری ئێوە کۆنابنەوە.

عەمرۆ وتی: ئەی قورە، ئایا ناباوەڕ بوویت؟ ئایا ئێمە لەعەرەبەکان دەترسێنیت؟ سوێند بەخوا کارێك دەکەم سوارەکان لەناو هێلانەی زایینی دایکت هێرشتان بکەنەسەر. ئەو ڕۆشتە لای موسوڵمانەکان لەمەدینە و ئەم هەواڵەی پێدان. دەوریان گرت و پرسیاری زۆریان کرد. ئەو پێی وتن سوپاییەکان لەدەبا تا مەدینە ئامادەی هێرشکردن سەر موسوڵمانانن. خەڵك بڵاوەیان لێکرد و لەچەند بازنەیەك لەسەر زەوی دانیشتن. عومەر هات و ویستی سڵاو لەعەمرۆ بکات. ئەو لای بازنەیەك تێپەڕی کەعەلی و عوسمان و عەبدولرەحمان وسەعد و زوبەیر و تەڵحە لەوێدا بوون. کاتێك عومەر لێیان نزیککەوتەوە، بێدەنگ بوون. وتی: سەرقاڵی چی بوون؟ ئەوان وەڵامیان نەدایەوە. بەوانی وت: بەخۆتان دەوت لەعەرەبەکان بۆ گیانی قوڕەیشییەکان دەترسین. وتیان: ڕاستت وت. عومەر وتی: لەوان مەترسن کەسوێند بەخوا زیاتر لەوەی لەعەرەبەکان بۆ سەر ئێوە بترسم لەئێوە بۆ سەر عەرەبەکان دەترسم. سوێند بەخوا ئەی قوڕەیشییەکان ئەگەر بڕۆنە ناو کونێك، عەربەکان بەدوای ئێوەدا دێن. سەبارەت بەوان لەخوا بترسن.

عومەر شوێن کاری خۆی کەوت. کاتێك قورە کوڕی هوبەیرەیان بەئەسیری هێنایە لای ئەبوبەکر، عەمرۆعاسی وەك شایەتێك بۆ باوڕەداربوونی خۆی هێنایەوە. ئەبوبەکر، عەمرۆی بانگ کرد و پرسیاری لێکرد. عەمرۆ هەموو قسەکانی قورەی بۆ ئەبوبەکر گێرایەوە تا گەشتە باسکردنی زەکات. قورە وتی: ئەی عەمرۆ دەمت داخە! عەمرۆ وتی: نا سوێند بەخوا هەمووی باسدەکەم. ئەبوبەکر ئەوی بەخشی و بەئیسلامەکەی ئەو رازی بوو

## منداڵەکانی تەمیم و سەجاح

بەسەرهاتی منداڵەکانی تەمیم بەوشێوە بوو کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمانداڕانی خۆی لەناو ئەواندا بڵاو کردەوە. زێبرقان لەوان بوو وهەروەها سەهل کوڕی مینجاب و قەیس کوڕی عاسم و سەفوان کوڕی سەفوان و سەبرە کوڕی عەمرۆ و وەکیع کوڕی مالك و مالك کوڕی نوەیرە. کاتێك هەواڵی مردنی پێغەمبەر(د.خ) بڵاوبوویەوە، سەفوان کوڕی سەفوان لەگەڵ زەکات و خێراتی منداڵەکانی عەمرۆ رۆشتە لای ئەبوبەکر و قەیس کوڕی عاسم لەشوێنی خۆی مایەوە و دەیویست بزانێت زێبرقان چی دەکات تا پێچەوانەی ئەو کارە ئەنجام بدات. کاتێك زێبرقان لەکارەکانی لەو دواکەوت و چاوەڕوانی کرد، وتی: ئەی هاوار لەکوڕی عۆکەلیە! سوێند بەخوا نازانم چی بکەم. ئەگەر زەکات بۆ لای ئەبوبەکر بنێرم و بەیعەتی لەگەڵ بکەم، زێبرقان بەوەی پێیەتی لەناو منداڵەکانی سەعد بەسەر دەبات و من لەچاوی ئەوان دەخات و ئەگەر من لەناو منداڵەکانی سەعد بمێنمەوە، دەڕواتە لای ئەبوبەکر و لای ئەو خراپم دەکات. ئەو، ئەوانی بەسەر مەقاعس و تایەفەکان دابەش کرد. زێبرقان گەیشت و بەدوای زەکات و خێراتی سەفوان، زەکات و خێراتی رەبابی برد کەئەمانە بوون: زەببە کوڕی ئۆد کوڕی تابخە و عودەی و تیم و عۆکەل و سور منداڵەکانی عەبد مەنات کوڕی ئۆد. هەروەها زەکاتی عەوف و ئێرانییەکانی برد و ئەوان لەتایەفەکانی تەمیمن. دواتر قەیس پەشیمان بوویەوە. کاتێك عەلا کوڕی حەزرەمی ڕۆشتەسەری، زەکاتەکەی هەڵگرت و بەوە پێشوازی لێکرد و دواتر لەگەڵ ئەو ڕۆشت و تەمیمیەکان سەرقاڵی یەکتر بوون.

بۆ سـومامە کـوڕی ئوسـالی حەنـەفی هاوکـاری و دارایـی و پیـاوانی شـەڕکەر لەتەمیمیەکانـەوە دەگەیـشت. کاتێـك ئـەم ڕووداوە هاتـەپێش، ئـەم کـارە زیـانی لەسومامەدا. ئەو لەشەڕکەرانی موسەیلەمەی درۆزن بوو تا ئەوەی عێکرەمـە کوڕی ئـەبی جـەهل ڕۆشتەسـەری. لەوکاتـەی خـەڵك لـەناو تـەمیم بـوون و موسـوڵمانان لەبەرابەر داواکاران و هەڵگەڕاوەکان لەدین و گومانکەران خۆڕاگریان دەکرد، لەناکاو سەجاحی تەمیمی کچی حارس کوڕی سوەید کوڕی عوقفان هێرشیکردە سەر ئەوان کەلەجەزیرەوە دەهات و بانگەشەی پێغەمبەری دەکرد. ئەو لەگەڵ کەسـەکانی خۆی لەناو زەوی و زارەکانی خۆیـان لەتەغلـەب دەژیا و سـەرۆکایەتی گـەورەکانی ڕەبیعـە لەدەستا بوو و هوزەیل کـوڕی عیمـران لەگـەڵ ئەو لـەناو تەغلەبیـەکان ژیـانی بەسـەر دەبرد. ئەو مەسیحی بوو بەڵام وازی لەدینەکەی خۆی هێنا و شوێن ئەو ژنە کـەوت. عەقە کوڕی هیلال لەنـەمر بوو و زیـاد کـوڕی بهمـان لەئـەیاد و سـەلیل کـوڕی قـەیس لەشـیبان. چـوونکە دژایـەتی یـەکتریان دەکـرد، ڕووداوێکـی زۆر گـرانتر لـەوەی بەسەریان هاتبوو، لەناو ئەواندا ڕوویدا.

سەجاح دەیویست بەشەڕ دەست بەسەر ئەبوبەکردا بگرێت. لەبەر ئەمە کەسی بۆ لای مالك کوڕی نـوەیرە نـارد و داوای هاوکـاری و یارمـەتی ئـەوی کـرد. ئـەو وەڵامـی ئەو ژنەی دایەوە و لەشەڕ کـردن لەگـەڵ ئەبوبـەکر دووری خستەوە تـا هێـرش بکاتـە سـەر تایەفـەکان لەمناڵـەکانی تـەمیم. ژن ڕازی بـوو و وتـی: مـن ژنێکم لەمناڵـەکانی یەربوع. ئەگەر ئەم پاشایەتییە سـەر بگرێت بۆ ئێوە دەبێت. عـەتارد کوڕی حاجب وگەورەکانی مناڵەکانی مالك و حەنزەلە بـەرەو لای مناڵـەکانی عەنبـەر ڕایـان کـرد و ئـەو کـارەی وەکیعیـان پـێ نـاخۆش بـوو. ئـەو لەگـەڵ ئـەو ژنـە ببـووە هاوپـەیمان. هاوتاکانی ئەوان لەمناڵەکانی یەربوع، پشتیانکردە ئەو ژنە و کارەکـەی مالـك کوڕی نوەیرەیان پێ ناخۆش بوو. مالك و وەکیع و سـەجاح پێکـەوە کۆبوونـەوە و سـەجاح وتەی ئاهەنگداری بۆ وتن و وتـی: سـوارەکان ئامـادە بکـەن و هێرشـیان بکەنەسـەر، دواتر هێرشبکەنە سەر ڕەباب تا زاری شەڕ نەدۆڕێنن. بەرەو لای ئـەوان بەرێکـەوتن. عەبـد مـەنات و زەببـە ڕووبـەڕوویان بوونـەوە و کەسـانی زۆر لـەم نـاوەدا کـوژران وبەدەسـتی یـەك ئەسـیر کـران و دواتـر پـەیمانی ئاشـتییان واژۆ کـرد. قـەیس کـوڕی

عاسم شێعرێکی هۆنییەوە کەباسی پەشیمانبوونی خۆی دەکرد کەبۆ بەزەکاتەکەی خۆی لەڕۆشتن بۆ لای ئەبوبەکر درەنگی کردووە.

دواتر سەجاح لەگەڵ سوپاکەی جەزیرە بەرێکەوت تاگەشتە نباج و لێرە ئەوس کوڕی خەزیمەی هۆجیمی لەمناڵەکانی عەمرۆ هێرشی کردەسەریان و هوزیل و عەقەی بەئەسیری گرت. دواتر لەسەر ئەوە رێککەوت کەئەوس ئەسیرەکانی سەجاح ئازاد بکات و کەس هێرش نەکاتە سەر سەرزەمینی ئەوس و هاورێکانی.

دواتر سەجاح لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرێکەوت و مەبەستی یەمامەی کرد و وتی: یەمامە بگرن، لەوێ وەك کۆترەکان باڵ بکەنەوە و سروود بهۆننەوە چوونکە ڕووبەڕووی شەڕێکی براوە دەبن و دوای ئەوە سەرکۆنە ناکرێن. ڕوویکردە مناڵەکانی حەنیفە و ئەم هەواڵە بەموسەیلمە گەیشت و ترسا ئەگەر ڕووبەڕووی ئەو ژنە ببێتەوە، سومامە و شەرەحبیل کوڕی حەسنە و هۆزەکانی دەوروبەری ئەوان دەست بەسەر حجر یانی یەمامە بگرن. لەبەر ئەمە، دیاری بۆ ئەو ژنە نارد و پەیك و پەیامی رەوانە کرد و داوای ئەمانی لێکرد. ژن ئەمانی پێبەخشی. ئەو لەگەڵ چل پیاو لەمناڵەکانی حەنیفە ڕۆشتە لای ئەو ژنە. موسەیلمە وتی: نیوەی زەوی بۆ ئێمەیە و نیوەی بۆ قوڕەیش بوو، ئەگەر دادپەروەری ڕەچاو بکردایە. خوا ئەو نیوەی کەقوڕەیش گەڕاندویەتییەوە، بەتۆی بەخشیوە.

لەو ئاییناتەی ئەو دایمەزراند، ئەوە بوو هەرکەس کوڕی دەبوو، لەنزیك لەگەڵ ژنان خۆی بەدوور دەگرت تا ئەو کوڕە بمرێت. دواتر بەمەبەستی مناڵبوون چێژی وەردەگرت تا کوڕێکی دەست کەوێت و ئیتر لەنزیك بوون لەژنان دەست هەڵگرێت.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو، بەڵکو موسەیلەمە لەو ژنە خۆی دەشاردەوە کەژنەکە پێی وت: وەرە. موسەیلەمە وتی: هاوڕێیانی خۆت دوورکەرەوە. ژن ئەو کارەی کرد. ئەو خێوەتەکەی بۆ ژنەکە هەڵدا و بۆنخۆشی کرد تا ژن لەبۆنە خۆشەکەی سەرمەست بێت و خوازیاری خەوتن بێت لەگەڵیدا. موسەیلەمە لەگەڵ ئەو کۆبوویەوە. ژن پێی وت: خواکەت چی وەحی پێکردوویت؟ موسەیلەمە وتی: ئایا نەتبینی چی کرد خواکەت لەگەڵ دووگیانەکان؟ دەریهێنا لەناخییەوە زادەیەکی ڕەوان، لەنێوان پەردەی جەرگەوە تا داوێنی مناڵان. ژن وتی: ئیتر چی

وەحی پێکردی؟ موسەیەمە وتی: خوا ژنانی ئافراند بە قوزی تەسک، پیاوان بۆ ئەوان هاوسەرانێکی بەفەرهەنگ، بتەپێنی لەناو ئەوان فریو، دەری بێنی بەروخسارێکی بێ چرچ و لۆچی، دواتر تازە زادەکانیان زرنگیان بێت. ژن وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری. موسەیلمە وتی: ئایا دەتەوێت تۆ بکەمە هاوسەری خۆم و بەهاوکاری خەڵکەکەت و خەڵکەکەم، عەرەب بخۆین و بیانلەوەڕێنین؟ ژن وتی: بەڵێ. موسەیلەمە وتی:

| الا قومی الی النیك | فقد هیی لك المضجع |
|---|---|
| فان شئت ففی البیت | وان شئت ففی المخدع |
| و ان شئت سلقناك | و ان شئت علی اربع |
| و ان شئت بثلثیه | و ان شئت به اجمع |

واتاکەی: هەستە باپێکەوە بخەوین کەجێگەم بۆ ئامادە کردوویت. ئەگەر بتەوێت لەماڵەوە بێت و ئەگەر بتەوێت لەسوچێکیدا، ئەگەر بتەوێت لەسەر پشت دەتخەوێنم و ئەگەر بتەوێت چوار دەست وپێ داتدەنیشێنم. ئەگەر بتەوێت دولەسەر سێی ت بۆ تێدەخەم و ئەگەر بتەوێت هەمووی.

ژن وتی: بەڵکو هەمووی چوونکە بەربڵاوی باشتر کۆدەکاتەوە. موسەیلەمە وتی: بەمشێوەیش وەحی بەمن گەیشتووە. ژن بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لای مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی. وتیان: پێمان بڵێ چیت بەدەست هێناوە؟ وتی: لەسەر ڕاستی و دروستی بوو و من باوەڕم پێکرد و بووم بەهاوسەری. وتیان: مارەیی هیچی بەتۆدا؟ ژن وتی: نە. وتیان: بگەڕێرەوە و داوای مارەیی لێبکە. ژن گەڕایەوە. کاتێك موسەیلەمە ئەوی بینی، دەرگای قەڵاکەی بەبەهێزی داخست و وتی: چیت لەمن دەوێت؟ ژن وتی: مارەیی. موسەیلەمە وتی: پێشەنگەکەت کێیە؟ وتی: شەبەس کوڕی ڕیبعی ریاحی. موسەیلمە پێشەنگەکەی بانگ کرد و وتی: لەناو هاورێکانت جار بدە کەموسەیلەمە پێغەمبەری خوا، دوو نوێژی لەنوێژەکانی محەممەد لەسەر هەڵگرتن: نوێژی بەیانی و نوێژی خەوتن. ژن لەگەڵ هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە کەئەمانە لەناویاندا بوون: عوتارد کوڕی حاجب و عەمرۆ کوڕی ئەهتەم و غەیلان کوڕی خەرەشە و شەبەس کوڕی ڕیبعی ریاحی. عوتارد کوڕی

حاجب وتی:

امست نبيتنا انثى نطوف بها          و اصبحت انبياء الناس ذكرانا

واتاكـەی: پێغەمبــەری ئێمــە مێــچکەیەکە بــەردەوام بــەدەوری دەســوڕێینەوە و پێغەمبەری خەڵکانیتر نێرە.

موسەیلەمە لەسەر ئەم بنەمایە ئاشتی لەگەڵ کرد کەدانەوێڵەی یەمامە بدات بەو. یەکسالْ نیـوەی خـۆی وەریگرێـت و نیوەکـەیتری کەسـانی خـۆی دیـاری بکـات بـۆ وەرگـرتنی. ئـەو نیـوەی دانەوێڵەکـەی وەرگـرت و گەڕایـەوە بـۆ جـەزیرە و هوزەیـل و زیاد و عەقەی لای ئەو دانا تا نیوەکەی تر وەربگرن. لەم کارەدا بوون لەناکاو خالیـد کوڕی وەلید وەك شاهین هێرشیکردە سەریان و هەموو ئەوانی وەك تەپ و تۆز بلاْو کردەوە.

سەجاح لەناو تەغلب دابوو تا معاویە لەسالْی (هەمەگان) ئەوانی کۆچ پێکرد. ئەو لەگـەڵ ئـەوان هـات و بـاوەڕی ئـەو و بـاوەڕی ئـەوان بـەهێز بـوو. سـەجاح بـۆ بەسـرە کۆچی کرد و لـەویْ مـرد وسـەمەرە کـوڕی جەنـدەب نوێـژی لەسـەر خوێنـد. سـەمەرە فەرمانداری بەسرە لەلایەن معاویەوە بـوو و ئەمـە پـێش ئـەوە بـوو عوبەیداللـە کـوڕی زیاد لەخوراسانەوە بێت و فەرمانداری بەسرە بگرێتە دەست.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك موسەیلەمە کوژرا، سەجاح بۆ لای خاڵەکانی لەتەغلـەب رایکرد و لای ئەوان مایەوە و هیچ نا و نیشانێکی لێنەبیسترا.

## چارەنوسی مالك کوڕی نویرە

کاتێك سەجاح بۆ جەزیرە گەڕایەوە، مالك کوڕی نەویرە پەشیمان بوویەوە وسەرگەردان و پشتیکردە ئەندێشەکەی. وەکیع و سەماعە قێزەونی کارەکەی خۆیان بینی و هاتنەوە سەر دینی ئیسلام و یاخیگەریان نەکرد و بەزەکات و خێراتەوە پێشوازی خالیدیان کرد. خالید لەکاری فەزارە و غەتەفان و تەی و ئەسەد تەواو بوو و ڕوویکردە بوتاح. لەوێ مالك کوڕی نەویرە بوو کەلەکارەکەی سەرگەردان ببوو. ئەنسار هاوڕێیەتی خالیدیان نەکرد و وتیان: ڕاسپاردەکەی جێگری پێغەمبەر(د.خ) ئەمە نەبوو کەئەگەر لەبوزاخە تەواو بووین لەشوێنێك بمێنینەوە تا خۆی بۆمان بنوسێت و فەرمانەکەی خۆیمان پێبڵێت. خالید وتی: بەمنی ڕاسپاردووە درێژە بەرێگاکەی خۆم بدەم. فەرماندە منم. ئەگەر نوسراویش نەدەهات وئەوەی من بەدەرفەتم دەزانی کە بەئاگادار کردنەوەی ئەو لەدەست دەرۆشت، ئاگادارم نەدەکردەوە. بەمشێوەیە ئەگەر گرفتاری کارێك بووین کە هیچ ڕاسپاردەیەکمان پێنەبێت، باشترین ڕێگە چارە کەدەبێت بیدۆزینەوە، نابێت پشت گوێ بخەین و دەستبەرداری کارەکە بین. من لەگەڵ هاوڕێیانی خۆم ئامەنگی مالکم هەیە و ئەوان بەزۆر بۆ هیچ کارێك ناچار ناکەم. خالید ڕۆشت و ئەنسار پەشیمانبوونەوە و وتیان: ئەگەر خێرێك بەمان بگات، ئێوە لێی بێبەش دەبن و ئەگەر زیانیان بەرکەوێت، خەڵك لەئێوە خۆیان بەدور دەگرن و بەگوناحکارتان دەزانن. دووبارە پەیوەستی بوون.

ئەوسا بەرێکەوت تا گەشتە بوتاح بەلأم لەوێ کەسی نەبینی. مالك کوڕی نویرە ئەوانی بڵاو کردبوویەوە و ڕێگەی کۆبوونەوەی لێگرتبوون. وتبووی: ئەی منالەکانی یەربوع، داوای گەڕانەوەیان بۆ سەر دین لێکردین و ئێمە درەنگمان کرد و ڕزگار نەبووین. تێرامام و بینیم ئەم کارە بێ پێشبینی و پلاندانان لەبەرژەوەندی ئەوان دەبێت و خەڵك ناتوانن خۆراگری بکەن. خۆتان بەدوور بگرن لەدوژمنایەتی لەگەڵ خەڵکێك کەخۆیان بەختەوەرن. لەیەکتر جیاببنەوە و بڵاوەی لێبکەن. کاتێك

خالید گەشتە بوتاح، سوپاکەی بۆ هەر لایەك نارد و فەرمانیدا جاری گەڕانەوە بۆ سەر ئیسلام لێبدەن و هەرکەس وەلأمی نای دایەوە، بیهێننە لای ئەو و ئەگەر رازی نەبوو، لەملی بدەن. ئەبوبەکر پێی راسپاردبوون، ئەگەر ڕۆشتنە شوێنێك، نەترسن و بانگ بدەن. کاتێك خەڵك یەکدەست بوون و بانگیاندا، وازیان لێبێنن، ئەگەر بانگیان نەدا، ئەوان بکوژن و تالأنیان بکەن. ئەگەر بەداواکەمان رازی بوون، داوای زەکاتیان لێبکەن کەئەگەر دایان لەوانی وەربگرن وئەگەر نەیاندا بیانکوژن.

دەڵێت: سوارەکان مالك کوڕی نویرەیان لەگەڵ چەند کەسێکیتر لەمناڵەکانی سەعلەبە کوڕی یەربەع هێنایە لای خالید. سوپاکە بەجیاوازی سەبارەت بەوان قسەیان کرد. لەناو شایەتەکان کەسانێك بوون دەیانوت ئەوان بانگیانداوە و نوێژیان خوێندووە. کاتێك سەبارەت بەوان بەجیاوازی قسەیان کرد، خالید فەرمانیدا ئەوان زیندانی بکەن و ئەو شەوە بەرادەیەك سارد بوو، هیچ کەس و هیچ شتێك نەیدەتوانی بەرگەی بگرێت. خالید فەرمانی بەجارچییەکدا جار بدات: ((ادفئوا اسراکم)). ئەم وتارە لەعەرەبیدا ماناکەی بەمشێوەیە کە( ئەسیرەکانی خۆتان گەرم بکەنەوە). خەڵك گومانیان کرد ئەو داوای کردووە بیانکوژن بەلأم ئەو تەنیا مەبەستی گەرمکردنەوە بوو. لەبەر ئەمە ئەوانیان کوشت و مالك بەدەستی زیرار کوڕی ئەزوەر کوژرا. خالید دەنگی گریان و شین و ڕۆڕۆی بیست و کاتێك هاتەدەر، بینی ئەوانیان کوشتووە. وتی: کاتێك خوا کارێکی بووێت، کۆتایی پێدێنێت. خالید هەمان شەو (دایکی تەمیم) هاوسەری مالکیکردە هاوسەری خۆی. عومەر بەئوبەبەکری وت: شمشێری خالید بەناڕەوا سەری بڕیوە. عومەر لەم بابەتەدا پێداگری زۆری کرد وئەبوبەکر وتی: دەمت داخە ئەی عومەر! هەڵەیەك ڕوویدا. واز لەسەرکۆنە کردنی خالید بێنە کە من شمشێرێك کەخوا لەناباوەڕانی دەدات، ناکەمە ناو کالأن. ئەو خوێنبایی مالکیدا و نامەی بۆ خالد نووسی تا بگەڕێتەوە. خالید گەڕایەوە. ڕۆشتە ناو مزگەوت و عابایەکی پێوە بوو و لەسەر دەستارەکەی سەری چەند تیرێك. عومەر هەستا، تیرەکانی لەدەستارەکەی دەرکێشا، شکاندی و وتی: پیاوێکی موسوڵمانت کوشت و ئەوسا پەڕیتە سەرژنەکەی. سوێند بەخوا بەبەردەکانی خۆت بەردبارانت دەکەم! خالید لەگەڵ ئەو

قسەی نەدەکرد چوونکە دەیزانی بۆچوونی ئەبوبەکر چۆنە. ئەو ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و داوای لێبووردنی کرد. ئەبوبەکر لێی خۆش بوو و چاوی لێپۆشی بەڵام سەبارەت بەو پەیوەندییە ناشیرینەی لەگەڵ ئەو ژنە بەستبووی و عەرەبەکان لەکاتی شەڕ بەکارێکی قێزەونیان دەزانی، سەرکۆنەی کرد. خالید ڕۆشت و عومەر دانیشتبوو. وتی: وەرە لای من ئەی کوڕی دایکی سەلەمە. عومەر زانی کەئەبوبەکر لێی رازی بووە. لەبەر ئەمە قسەی لەگەڵ نەکرد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك موسوڵمانان مالك و هاوڕێکانیان لەشەودا گەمارۆدا، کەرەستەی شەڕیان هەڵگرت و وتیان: ئێمە موسوڵمانین. هاوڕێیانی مالکیش وەڵامیان دانەوە: ئێمەیش موسوڵمانین. وتیان: شمشێرەکانتان بخەنە سەر زەوی. ئەوان شمشێرەکانیان دانا و دواتر نوێژیان خوێند. ئەو لەکوشتنی بەمشێوە داوای لێبووردنی دەهێنایەوە کەمالك پێی وتبوو: سەبارەت بەسەروەرتان (لەوانەیە پێغەمبەر(د.خ) ) گومانم نییە ئەمە و ئەوەی وت. مالك بەخالید وتی: ئایا ئەو بەسەروەری خۆت نازانی؟ ئەوسا لەملیدا.

دوای ئەوەی موتەممەم کوڕی نەویرە هاتە لای ئەبوبەکر و داوای خوێنی براکەی کرد و هەروەها داوایکرد ئەسیرەکانیان ئازاد بکەن. ئەبوبەکر فەرمانیدا ئەسیرەکان ئازاد بکەن و خوێنبایی مالك لەگەنجینە بدەن. کاتێك موتەممەم ڕۆشتە لای عومەر، عومەر وتی: خەم و خەفەت لەمەرگی براکەت گەشتۆتە کوێ؟ وتی: یەك ساڵ بۆ ئەو گریان بەرادەیەك چاوە نابیناکەم لەچاوە بیناکەم داوای یارمەتی کرد. هەرجار کەئاگرێکم دەبینی، بەشێوەیەك ئاگرم تێبەردەبوو کەگیان دەیویست لەجەستەم بڕواتەدەر چوونکە ئەو بەردەوام ئاگری تا بەرەبەیان نەدەکوژاندەوە نەکا میوانێك بێت و شوێنەکەی نەدۆزێتەوە. عومەر وتی: وەسفی ئەو بۆ من بکە. موتەممەم وتی: لەشەوە ساردەکانی زستان ڕوپۆشێکی کراوە دەکردە سەرشانی و ڕمێکی درێژی هەڵدەگرت و سوار ئەسپێکی یاخی دەبوو و وشترێکی گرانباری لەتوێشو باردەکرد و لەهەردوولای خۆی دوو مەشکەی ئاوی شۆڕ دەکردەوە وتا بەرەبەیان بەرێگادا دەڕۆشت تاهاریکاری هەرماندوو یاپەککەوتەیەك بکات. کاتێك خۆرهەڵدەهات، بەروخسارێکی داگیرساو دەگەڕایەوە. عومەر وتی: چەند دێرێك لەو

شێعرانەی بۆ پرسەی ئەو وتوتە، بیخوێنە. ئەو قەسیدەیەکی خوێندەوە کەئەم بەیتانەی تیا گونجاندبوو:

وكنا كندماني جذيمة حقبة — من الدهر حتى قيل لن يتصدعا

فلما تفرقنا كاني و مالكا — لطول اجتماع لم نبت ليلة معا

واتاکەی: من و مالك لەهاونشینی لەجەزیمە دەچووین و رۆژگارێکی درێژ پێکەوە بووین بەشێوەیەك دەوترا: هەرگیز ئەم دووانە لەیەك جیانابنەوە. کاتێك جوێ بووینەوە، وەك بڵێی بەو هەموو ساڵانەی پێکەوە بووین، یەك شەومان بەیەکەوە بەسەر نەبردووە.

عومەر وتی: ئەگەر دەمزانی شێعر بهۆنمەوە، بەمشێوەیە زەیدی برام وەسف دەکرد. موتەممەم وتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان، بەرابەر نین. ئەگەر مەرگی براکەم هاوشێوی مەرگی براکەی تۆبوایە، بۆی نەدەگریام. عومەر وتی: کەس باشتر لەتۆ دڵی منی نەداوەتەوە لەمردنی براکەمدا.

هەروەها لەم ڕووداوەدا وەلید و ئەبوعوبەیدە کوڕی عومارە کوڕی وەلید (برازاکانی خالید) کوژران. ئەم دووانە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسەیان کردبوو.

## موسویلەمە و خەڵکی یەمامە

پێشتر ئاماژەمان پێدا موسەیلەمە هاتە لای پێغەمبەر(د.خ). کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد وئەبوبەکر سوپای کردە سەر هەڵگەڕاوەکان، عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهلی بەسوپایەکەوە ناردە سەر موسویلەمە و شەرەحبیل کوڕی حەسنەی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد. عێکرەمە پەلەی کرد تا ئەم شانازییە بەو ببڕێت. لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و تێکیان شکاند. کاتێك شەرەحبیل ئەم هەواڵەی بیست، لەسەر ڕێگاکە مایەوە. عێکرەمە هەواڵی ئەم ڕووداوەی بۆ ئەبوبەکر نووسی. ئەبوبەکر بۆی نووسی: تۆ نابینم و تۆیش من نابینی. نەکا بگەڕێیتەوە و خەڵك لاواز و پەرێشان بکەیت. ڕوبکەرە حوزەیفە و عەرەفجە و شەڕی خەڵکانی مەهرە بکە. دواتر لەگەڵ سوپاکەت بڕۆ و خەڵك تاقیبکەرەوە تا دەگەیتە موهاجیر کوڕی ئەبی ئومەییە لەحەزەرمەوت. دواتر بۆ شەرەحبیلی نووسی چاوەڕێ بێت تا خالید دەگات. کاتێك

لەشەڕی موسویلەمە تەواو بوویت، پەیوەستی عەمرۆ کوڕی عاس ببە و لەشەڕی قوزاعە هاوکاری بکە.

کاتێك خالید لەبوتاح گەڕایەوە، ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و داوای لێبووردنی لێکرد. ئەبوبەکر بەداواکەی رازی بوو وچاوپۆشی لێکرد. موهاجیران و ئەنساری لەگەڵ نارد و ڕەوانەی شەڕی موسویلەمەی کرد. فەرماندەیی ئەنسار لەدەست سابت کوڕی قەیس کوڕی شەماسدابوو و فەرماندەیی موهاجیرەکان لەدەستی زەید کوڕی خەتاب و ئەبوحوزەیفە. خالید لەبوتاح مایەوە و چاوەڕوانی هێزە یارمەتیدەرەکانی دەکرد. کاتێك پێی گەیشتن مەبەستی یەمامەی کرد، منداڵەکانی حەنیفە لەمکاتەدا زۆر بوون و ژمارەیان دەگەشتە چل هەزار پیاوی شەڕکەر. شەرەحبیل کوڕی حەسنە پەلەی کرد ولەشەڕ لەگەڵ موسویلەمە پێش خالید کەوت و سەرکەوت کرا. خالید ئەوی سەرکۆنەکرد. ئەبوبەکر سەلیتی ناردە هاوکاری خالید تا پشتیوانی بێت و دوژمنان نەتوانن لەپشتەوە هێرشی بکەنەسەر. ئەبوبەکر بەردەوام دەیوت: مـن شەڕکەرانی بەدر ناکەمە فەرماندە بەڵکو ئەوان ئازاد دەکەم تا بەکردارە باشەکانی خۆیان بڕۆنە دیداری خواوەند چوونکە خوا لەگەڵ ئەوان و لەگەڵ شیاوەکان پێش ئەوەی سەرکەوتوویان بکات، زیانیان لێدوردەخاتەوە. عومەر ئەوانی دەکردە فەرماندە و فەرمانڕەوایی پێدبەخشین.

موسویلەمە، نەهار یا ڕەجال کوڕی عونفوەی لەگەڵدا بوو. ئەو ڕۆشتبووە لای پێغەمبەر(د.خ) و قورئان و فێرکارییە دینییەکان فێر ببوو. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی وەك مامۆستای خەڵکی یەمامە ڕەوانە کردبوو تا کارەکە لەسەر موسویلەمە دژوار و پەرێشان بکات. بەڵام زیانی ئەو بۆ منداڵەکانی حەنیفە زیاتر بوو لەزیانی موسویلەمە. شایەتیدا کەمحەممەد وتوویەتی: موسەیلەمە لەپێغەمبەریدا شەریکیەتی. خەڵك وتارەکەی ئەویان بەراست زانی و بەقسەکەی رازی بوون. موسویلەمە لەکاروبارەکان راوێژی لەگەڵ دەکرد و بۆچوونەکانی بەکار دەبەست. عەبدوڵڵە کوڕی نەواجە بانگی بۆ دەدا و حوجەیر کوڕی عومەیر پێشنوێژی بۆ دەکرد. حوجر دەیوت: شایەتی دەدەم موسەیلەمە گومان دەکات پێغەمبەری خوایە. موسەیلەمە پێی وت: بەڕوونی قسەکەت بکە. وتاری داپۆشراو هیچ

سودێکی نییە. ئەو یەکەم کەس بوو بەمشێوەی وت.

لەناو ئەو وتارانەی ئەو وەك وەحی باسی دەکردن ئەوە بوو: ئەی قرپۆکی لەقرپۆك بووی خۆڵەمێشی وەك فیل، ئاواز بخوێنە و سرود بڵێ، سەرەوەت لەئاوەکەدایە و خوارەوەت لەقوڕ و لیتە تا دڵ، نە بەو کەسەی ئاو دەخوات دەڵێی بڕۆ و نە ئاو تێکەڵ دەکەی لەگەڵ گڵ. هەروەها وتی: سوێند بەتازە ئافرێنراوان، جوتیارەکان، دروێنەکەران، گەنم چێنەران، دواتر ئاردکەران، ئارد بەنانکەران، دووبارە نان بەتریت هێنەران، لەگەڵ ڕۆن و چەوری تێکەڵ کەران و ئەوانەی لەدەم دەیجون، لەپێشتیان پێبڕا بەسەر ئاژەڵداران؛ لەپێشیان پێنەبڕا شارنشینەکان. ئاوی دەمتان قوت بدەن، دەستی هەژاران بگرن و ستەمکار بەدوژمن بزانن. ژنێك ڕۆشتە لای و وتی: دارخورماکانی ئێمە وشك بوون و چاڵەکانمان کەم ئاون. وەك محەممەد لەخوا بپارێرەوە تا دار خورماکان سەوز ببن و چاڵەکانمان پڕئاو، محەممەد ئەو کارەی بۆ خەڵکی هەزمان کرد، تۆ بۆ ئێمەی بکە. ئەو سەبارەت بەم کارە لەراوێژکارە دینەکەی خۆ یانی نەهار پرسیاری کرد و ئەو وتی پێغەمبەر(د.خ) لەخوا بۆ ئەوان پاڕایەوە و دواتر مشتێك لەئاوەکەی هەڵگرتن و لەناو دەمی خۆی غەرغەرەی پێکرد و دواتر کردییە ناو چاڵەکە. ئاو هەڵقولا و هەموو دارخورماکان تێراوبوون ولەوشك بوون رزگاریان بوو و لەبن هەر دارخورمایەك نەمامێکی کورت و شکۆفە کردوو، بەشکۆفەی خورما سەری دەرهێنا. موسەیلمەیش ئەو کارەی کرد بەلاّم ئاوی چاڵەکە وشکی کرد و دارخورماکان وشك بوون. ئەم بابەتە دوای لەناوچونی ئەو ئاشکرا بوو.

دووبارە نەهار پێی وت: وەك محەممەد دەست بەسەر و ڕووخساری منداڵەکانی حەنیفە بکێشە. ئەو ئەم کارەی کرد دەستی خۆی بەسەر روخساری تازەزاکان و منالاّندا کێشا و نانی لەدەمدا جاوی و کردییە دەمی ئەوان. هەر منالێك کەدەستی بەسەردا دەهێنا کەچەڵ دەبوو، و هەرکەس نانی دەکردە ناو دەمی، زمانی دەگیرا. ئەم بابەتەیش دوای مردنی خۆی دەرکەوت.

هەروەها پیاوێك بەناوی تەلحەی نەمری هاتە لای و پرسیاری خۆی لێکرد. موسەیلمە وتی: پیاوێك لەتاریکی دێتە لای تۆ. تەلحە وتی: شایەتی دەدەم تۆ

درۆزنیت و محەممەد راستگۆیە. بەلاّم درۆزنی رەبیعە لای ئێمە خۆشەویسترە لەراستگۆی موزێر. ئەو لەشەڕی عەقرەبا وەك کەسێکی ناباوەڕ لەگەڵ موسەیلمە کوژرا.

کاتێك هەواڵی نزیکبوونەوەی خالید بەموسەیلەمە گەیشت، سوپاکەی خۆی لەعەقرەبا کۆکردەوە و خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە و مەجاعە کوڕی موراره لەگەڵ لەشکرەکەی خۆی هات تا خوێنێك کەمناڵەکانی عامر لەکەسانی ئەو ڕشتبوویان، داوای بکات. موسوڵمانەکان ئەو و هاورێکانیان گرت. خالید ئەوانی کوشت و ئەوی لەبەر پێگەکەی لەناو مناڵەکانی حەنیفە بەزیندوویی هێشتەوە. ئەوان چل یا شەست کەسێك دەبوون.

موسوویلەمە سامانەکەی خۆی لەپشت سەریەوە بوو. شەرەحبیل کوڕی موسەیلەمە وتی: ئەی مناڵەکانی حەنیفە شەڕ بکەن چوونکە ئەمڕۆ رۆژی پیاوەتییە. ئەگەر شکەست بخۆن، ژنەکانتان بەئەسیری دەگرن و بێ ڕێورەسمی هاوسەرگیری دەیانخەنە ژێر خۆیان. لەپێگەی بەرزی خۆتان بەرگری بکەن و ژنەکانتان بپارێزن. شەڕێکی قورس و دژوار لەعەقرەبا دەستی پێکرد. ئالاّی سوپای موهاجیر لەدەستی سالم کۆیلەی باوکی حوزەیفەدا بوو. پێشتر لەدەستی عەبدالله کوڕی حەفس کوڕی غانمدا بوو. ئەو کوژرا. پێیان وت: لەئێمە بۆسەر خۆت دەترسیت! وتی: قێزەون بێت هەڵگری قورئانێك کەمن بم ئەگەر ئەو کارە بکەم! ئالاّی ئەنسار لەدەستی سابت کوڕی قەیس کوڕی شەماسدا بوو وعەرەبەکان لەژێر ئالاّکانی خۆیاندا بوون. خەڵکان ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. یەکەم کەس کەڕووبەڕووی موسوڵمانان بوویەوە، نەهار یانی رەجال کوڕی عونفوە بوو کەدەستبەجێ کوژرا. زەید کوڕی خەتاب ئەوی کوشت. شەڕ دژوارتر بوو. موسوڵمانان هیچ کات شەڕی لەمشێوەیان تاقینەکردبوویەوە. موسوڵمانان شکستیان خوارد ومناڵەکانی حەنیفە بەرەو پێش ڕۆشتن و خۆیان گەیاندە خالید و مەجاعە. خالید لەخێوەتەکەی خۆی پاشەکشێی کردبوو و سوپای موسویلەمە ڕوویانکردە مەجاعە کەلای ژنەکەی خالید بوو (خالید خۆی بەوی سپاردبوو). ویستیان بیکوژن کەمەجاعە ڕێگەی لێگرتن و وتی: من پشتیوانی ئەوم. ئەویان

ئازاد کرد. وتیان: پیاوان بگرن. دواتر خێوەتەکەیان دڕاند. موسوڵمانان یەکتریان بانگ دەکرد. سابت کوڕی قەیس وتی: ئەی موسوڵمانان! قێزەون بێت ئەوەی خوتان پێوەگرتووە! ئەی خوایە، من لەوەی یەمامییەکان دەیکەن، لای تۆ بێزاری دەردەبڕم و لەوەی موسوڵمانان دەیکەن، داوای لێبووردن دەکەم. سابت شەڕی کرد تا کوژرا.

زەید کوڕی خەتاب وتی: دوای ئەم پیاوانە، ئیتر رێگە نادەین سەرگەردان بین. سوێند بەخوا ئەمڕۆ بەهیچ شێوەیەك قسە ناکەم تا ئەوان شکەست دەدەین یا دەکوژرێم و بەبەڵگە و پەیمانی بەهێزی خۆم لەگەڵ خوا قسە دەکەم. ئەی خەڵکینە، چاوەکانتانە دابخەن و زەخت لەددانەکانتان بکەن و بۆ پێشەوە هێرش بەرن. باوکی حوزەیفە وتی: قورئان بەکار و کۆشش برازێننەوە. خالید لەگەڵ پیاوەکان هەوڵیدا دوژمن بۆ دوورترین شوێن پاشەکشێ پێ بکات. شەڕ قورس ومناڵەکانی حوزەیفە یەکتریان بۆشەڕ هاندەدا و شەڕێکی قورسیان کرد. لەم رۆژەدا، شەڕ هەندێکات لەبەرژەوەندی موسوڵمانان و هەندێ کات لەبەرژەوەندی نابـاوەڕان بوو. سالم و باوکی حوزەیفە و زەید کوڕی خەتاب و دەستەیەکیتر لەموسوڵمانان کوژران. کاتێك خالید ئەمەی بینی، هاواری کرد: ئەی خەڵکینە لەیەك جیا ببنەوە تا بزانین هەردەستە و تاقمێك چۆن شەڕ دەکەن و لەکوێوە زیانمان پێدەگات. خەڵك لەیەکتر جیابوونەوە. بیابانشینەکان خۆیان لەموهاجیر و ئەنسارەکان بەدوور گرتبوو و ئەمان لەوان. کاتێك لەیەك جیابوونەوە، بەیەکیان وت: ئەمڕۆ هەڵاتن هۆکاری شەرمەزارییە. هیچکات رۆژێکی دژوارتر لەو رۆژە نەبینرا. کەس نەیزانی کام سوپایە سەرکەوتووتر و کامیان زیانی زۆرتری بەرکەوت جگە لەوەی ئەنسار و موهاجیر زیاتر لەبیابانشینەکان کوژران.

موسەیلەمە بەبەهێزی خۆڕاگری کرد و لەبەر ئەمە ئاشی مەرگ بەدەوری ئەو دەستی بەسوڕان کرد. خالید زانی تەنیا بەکوشتنی موسەیلەمە ئەم شەڕە دادەمرکێتەوە. مناڵەکانی حەنیفە گوێیان بەکوژراوە زۆرەکانی خۆیان نەدا. دواتر خالید هاتە ناو گۆڕەپان و دروشمی موسوڵمانانی وتەوە. دروشمی ئەوان ئەمە بوو: ئای محەممەدا! هەرکەس ویستی ڕووبەڕووی ببێتەوە، خالید کوشتی. ئاشی

موسوڵمانان دەستی بەسوڕان کرد. خالید بانگی موسەیلەمەی کرد و ئەو وەڵامی دایەوە. ئەو بۆچەند شتێك کەدەیویست و ئارەزوی دەکرد، پێشنیاری پێکرد. کاتێك موسویلەمە دەیویست وەڵام بداتەوە، ئاوڕی دەدایەوە و لەگەڵ شەیتانەکەی خۆی راوێژی دەکرد و دێو لەرازی بوون بەپێشنیارەکان دووری دەخستەوە. جارێك ئاوڕی دایەوە، خالید پەلاماریدا و هیلاك و بێزاری کرد. ئەو هەڵات و هاورێیانی نەجولان. خالید لەناو خەڵك هاواری دەکرد و ئەمان بەسەر ئەوان زاڵبوون. هاوەڵانی موسەیلەمە شکستیان خوارد. پێیان وت: کوا ئەو مزگێنیانەی بەئێمەت دەدا؟ وتی: لەپێگە و ژن و منداڵەکانی خۆتان بەرگری بکەن. بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی منداڵەکانی حوزەیفە، بەرەو باغەکە رابکەن، بەرەو باغەکە رابکەن! ئەوان ڕوویانکردە باغەکە.

بورا کوڕی مالیك برای ئەسەد کوڕی مالیك، کاتێك لەشەڕێك ئامادە دەبوو، لەرزەیەك دەیگرتەوە و پیاوان لەسەر سەری دادەنیشتن و ئەو میزی دەکرد و دواتر وەك گای نێر دەخرۆشا. ئەم جارەیش بەهەمان شێوە. کاتێك میزی کرد، خرۆشا و وتی: ئەی خەڵکینە وەرنە لای من کەبورا کوڕی مالکم! وەرنە لای من! وەرنە لای من! ئەو زۆر پیاوانە شەڕی کرد. کاتێك منداڵەکانی حوزەیفە ڕۆشتنە ناو باغەکە، بورا وتی: ئەی موسوڵمانەکان، من فڕێدەنە ناو باغەکە بۆ لای ئەوان. وتیان: ئەو کارە ناکەین. وتی: سوێند بەخوا دەبێت ئەو کارە بکەن. خەڵك ئەویان خستە سەر قەڵغانێك و بەڕمەکان بەرزیان کردەوە تا ڕۆشتە سەر دیوارەکە و خۆی خستە ناو باغەکە و هێرشیکردە سەر ئەوان و لای دەرگاکە شەڕی کرد و کردییەوە و موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو باغەکە و شەڕیان دەست پێکرد. کوژراوان لەهەردوولا بەتایبەت منداڵەکانی حوزەیفە زیادی کرد. بەهەمان شێوە سەرقاڵی شەڕ بوون تا موسویلەمە کوژرا. لەکوشتنی ئەو وەحشی کۆیلەی جوبەیر کوڕی موتعیم و پیاوێك لەئەنسار بوونە شەریك. وەحشی بەزوبین و ئەنسارییەکە بەشمشێر. کوڕی عومەر دەڵێت: پیاوێك هاواری کرد: ئەم کۆیلە ڕەشە موسەیلەمەی کوشت. دوای کوژرانی ئەو منداڵەکانی حوزەیفە شکستیان خوارد و هەڵاتن. موسوڵمانان لەهەر لاییێکەوە کوشتاریان دەکردن. هەواڵی کوژرانی موسەیلەمەیان بەخالیددا. ئەو لەگەڵ

مەجاعــە، داپۆشــراو بەکەلوپــەلی ئاســنین، بۆپێــشەوە ڕۆشــت و داوای لێکــرد موسەیلمەی نیشان بدات. ئەو بەناو کوژراواندا دەگەڕا و باسی دەکردن تا گەشتە مەحکەمی یەمامە کەپیاوێکی جوان ڕوخسار بوو. وتی: ئەمە سەروەری ئێوەیە؟ مەجاعە وتی: نە، سوێند بەخوا ئەم بەرێزتر و ڕێزداترە لەو. ئەمە مەحکەمی یەمامەیە. دواتر ڕۆشتنە ناو باغەکە وپیاوێکی بینی زەرد بەلوتێکی ئاوساو و ناوچاوێکی پڕچرچ و لۆچ. مەجاعە وتی: ونبووەکەی ئێوە ئەمەیە کە لەزیانی ئەو ئاسودە بوون. خالید وتی: ئەمە ئەو کەسەیە ئێوەی گرفتاری ئەم زیانە گەورەیە کرد.

ئەو کەسەی مەحکەمی یەمامەی کوشت، عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر بوو. تیرێکی بۆ هاویشت کە لەچاڵی ژێر قورگی چەقی و کوشتی. ئەو لەم کاتەدا قسەی بۆ خەڵك دەکرد وبۆ شەڕ هانیدەدان. مەجاعە بەخالیدی وت: پیاوەکانی تۆ هەموویان بەپەلەن. قەڵاکان پڕن لەخەڵك، لەسەر ئەوەی هەمە، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ من ببەستە. خالید لەسەر بنەمای هەموو شتێك پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست جگە لەخەڵکان. پێی وت: بڕۆ لای ئەوان و راوێژیان لەگەڵ بکە. مەجاعە ڕۆشتە لای ئەوان. لەناو قەڵاکان جگە لەمناڵ وپیر و پەککەوتە و ژنەکان کەسیتری لێنەبوو. ئەو بەکەرەستەی شەڕ تەیاری کردن و بەژنەکانی وت قژی خۆیان پەخشان بکەن و بچنەسەر دیواری قەڵاکان تا ئەو بۆلایان بگەڕێتەوە. ئەو گەڕایەوە بۆ لای خالید و وتی: بەوەی وتم رازی نەبوون. خالید بینی قەڵاکان لێوانلێوە لەخەڵك و شەڕ موسوڵمانانی هیلاك کردووە و دووری لەژن و منداڵ درێژەی کێشاوە و شەڕکەران دەیانەوێت بەسەرکەوتویی بگەڕێنەوە و نازانن چی ڕوودەدات. لەموهاجیر و ئەنسار و لەپیاوانی مەدینە سێسەد وشەست کەس و لەموهاجیرەکانی دەرەوەی مەدینە سێسەد کوژرابوون. سابت کوڕی قەیسیش کوژرا. پیاوێك لەبتپەرستەکان قاچی ئەوی بڕی و سابت قاچی براوی هەڵگرت وپیای کێشا و ئەوی کوشت. لەمناڵەکانی حەنیفە لەعەقرەبا حەوت هەزار کەس کوژران و لەناو باغەکە حەوت هەزار کەس ولەکاتی شوێن کەوتنیان ژمارەیەکی نزیك لەحەوت هەزار. خالید لەسەر بنەمای زێڕ و سیم و کەرەستەی شەڕ و نیوەی

ئەسیرەکان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. دەستەیەك دەڵێن: لەسەر یەك چواری ئەسیرەکان پەیمانی ئاشتی بەست.

کاتێك دەرگای قەڵاکان کرانەوە، بینیان جگە لەمناڵ و ژن و پیر و پەککەوتەکان کەسی لێنییە. خالید بەمەجاعەی وت: هاوار لەتۆ، منت فریودا! مەجاعە وتی: ئەمانە خەڵکانی منن و جگە لەمە نەمدەتوانی کارێك بکەم.

نامەی ئەبوبەکر بەخالید گەیشت کەفەرمانیدەدا هەر کوڕێکی تازەپێگەیشتو بکوژێت بەڵام ئەو پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستبوون و پەیمان شکێنی نەکرد. کاتێك گەڕانەوە، عومەر بەکوڕەکەی عەبدوڵڵەی وت: بۆ تۆ پێش لەبراکەم زەید نەکوژرایت؟ (زەید لەگەڵ ئەوان بوو و کوژرا). زەید کوژرا و تۆ زیندوویت! بۆ روخسارت لەمن ناشاریتەوە؟ عەبدوڵڵە وتی: ئەو داوای شەهید بوونی لەخوا کرد وپێی بەخشی، من داوام کرد وپێی نەبەخشیم.

## ڕووداوەکانیتر

لەم ساڵەدا دوای شەڕی یەمامە، ئەبوبەکر فەرمانی کۆکردنەوەی قوڕئانی دەرکرد چوونکە بینی زۆر لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)( زانەرانی قوڕئان) کوژران. مەبەستەکەی ئەوە بوو قوڕئان لەبیر نەچێتەوە. لەساڵی سیەم / ٦٥١ زایینی ئاماژە بەم بابەتە دەدەین.

لەناو هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کە لەشەڕی یەمامە شەهید کرا، ئەم کەسانە دەبینران: عیباد کوڕی بشری ئەنساری لەشەڕکەرانی بەدر، عەباد کوڕی حارس لەشەڕکەرانی ئۆحۆد، عومەیر کوڕی ئەوس کوڕی عەتیکی ئەنساری لەشەڕکەرانی ئۆحۆد، عامر کوڕی سابت کوڕی سەلەمەی ئەنساری، عەمارە کوڕی حەزمی ئەنساری برای عەمرۆ کوڕی حەزمی ئەنساری لەشەڕکەرانی بەدر، عەلی کوڕی عوبەیدالله کوڕی حارس لەمناڵەکانی عامر کوڕی لۆئەی لەهاوڕێیانی پێغەمبەر(د.خ)، عایز کوڕی ماعسی ئەنساری (کەدەستەیەك دەڵێن لەشەڕی چاڵی مەعونە کوژرا)، فەورە کوڕی نەعمان کەدەستەیەك دەڵێن کوڕی حارس کوڕی نەعمانی ئەنساری بوو و لەشەڕکەرانی ئۆحۆد و شەڕەکانی دوای ئەوە هەژمار

دەكرا. قەیس كوڕی حارس كوڕی عودەی ئەنساری مامی بەرائ كوڕی عازب كەدەستەیەك دەڵێن لەشەڕی ئوحود گیانی بەخشی، سەعد كوڕی جەمازی ئەنساری لەشەڕكەرانی ئوحود، ئەبودوجانەی ئەنساری لەشەڕكەرانی بەدر كەدەستەیەك دەڵێن زیندوو مایەوە و لەشەڕی سەفین هاوڕێ لەگەڵ عەلی شەڕی كرد (و خوا زاناترە)، سەلمە كوڕی مەسعود كوڕی سەنانی ئەنساری، سایب كوڕی عوسمان كوڕی مەزعونی جومەحی لەكۆچكەران بۆ حەبەشە و لەشەڕكەرانی بەدر، سایب كوڕی عەوام برای زوبەیر كوڕی عەوام، توفەیل كوڕی عەمرۆ دەوسی لەشەڕكەرانی خەیبەر، زورارە كوڕی قەیسی ئەنساری لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)، مالك كوڕی عەمرۆ سولەمی هاوپەیمانی منالەكانی عەبد شەمس لەشەڕكەرانی بەدر، مالك كوڕی ئومەییە سولەمی لەشەڕكەرانی بەدر، مالك كوڕی عەوس كوڕی عەتیكی ئەنساری لەشەڕكەرانی ئوحود، مەعن كوڕی عودەی كوڕی جەد بەلوی هاوپەیمانی ئەنسار لەبینەرانی عەقەبە وبەدر و هاوشێوەكانی، مەسعود كوڕی سەنانی ئەسوەد هاوپەیمانی منالەكانی غانم لەشەڕكەرانی ئوحود، نەعمان كوڕی عەسەر كوڕی رەبیعی بەلوی لەشەڕكەرانی بەدر، سەفوان و مالك كوڕانی عەمرۆ سولەمی لەبەدرییەكان، زورارە كوڕی ئەزوەری ئەسەدی ئەو كەسەی مالك كوڕی نویرەی بەفەرمانی خالید كوشت، عەبدوڵڵە كوڕی حارس كوڕی قەیس كوڕی عودەی سەهمی كەدەستەیەك دەڵێن لەگەڵ براكەی سایب لەتایف كوژرا، عەبدوڵڵە كوڕی مەخریمە كوڕی عەبدولعوزای عامری، عەبدوڵڵە كوڕی عەبداللە كوڕی ئەبی كوڕی سەلول لەشەڕكەرانی بەدر، عەبدوڵڵە كوڕی عەتیكی ئەنساری بكوژی حوقەیق لەشەڕكەرانی بەدر، شوجاع كوڕی ئەبی وەهبی ئەسەدی ئەسەد خوزەیمە لەشەڕكەرانی بەدر، هەریم كوڕی عەبدوڵڵە موتەلیبی قوڕەیشی و براكەی جونادە، وەلید كوڕی عەبد شەمس كوڕی موغەیرەی مەخزومی كوڕی مامی خالید، وەرەقە كوڕی ئەیاس كوڕی عەمرۆی ئەنساری لەشەركەڕانی بەدر، یەزید كوڕی ئەوس هاوپەیمانی منالەكانی عەبدولدار كەلەرۆژی گرتنی مەككە باوەڕی هێنا، باوكی حەببە كوڕی غەزییەی ئەنساری لەشەڕكەرانی ئوحود، باوكی عەقیلی بەلوی هاوپەیمانی ئەنسار لەبەدرییەكان، باوكی قەیس كوڕی حارس كوڕی قەیس كوڕی

عـودەی سـەهمی لەکۆچـکەران بـۆ حەبەشـە و شـەڕکەرانی ئۆحـۆد و یەزیـد کـوڕی سابت برای زەید کوڕی سابت.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکی بەحرەین لەئیسلام

کاتێـك جـارود کـوڕی موعـەلی عەبـدی هاتـە لای پێغەمبـەر(د.خ) و فێرکارییـە دینییەکان فێربوو، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ڕەوانـەی لای خەڵکەکـەی، عەبدئەلقـەیس کرد و لەناو ئەواندا مایەوە. دوای ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) مرد، مونزەر کوڕی ساوی نەخۆش کەوت و ماوەیـەك دوای مردنـی پێغەمبـەر(د.خ) مـرد. کاتێـك مونزەر کوڕی ساوی مرد، خەڵکی بەحرەین دوای ئەو لەئاییني ئیسلام هەڵگەڕانەوە. بەکرییـەکان لەسەر هەڵگەڕانەوەی خۆیان مانەوە و جارود خەڵکی بەحرەینی کۆکردەوە چوونکە بیستبووی ئەوان وتویانە: ئەگەر محەممەد پێغەمبـەر(د.خ) دەبوو، نـەدەمرد. کاتێك لای ئەو کۆبوونەوە، پێی وتن: ئایا دەزانن لەڕۆژگاری پێشوو، خوا پێغەمبەری تری نـاردووە؟ وتیـان: بـەڵێ. وتـی: چـوون بـۆ کـوێ؟ وتیـان: مـردوون. وتـی: محەممـەد پێغەمبەری خوایش وەك ئەوان مردووە. شایەتی دەدەم خوایەك جگە لـەخوا نییـە و محەممـەد پێغەمبـەری خوایـە. ئـەوان باوەڕیـان هێنـا و لەسـەر باوەڕەکـەی خۆیـان مانەوە. دوای ئـەوە هاوڕێیـان مونزەر ئەوانیان گەمارۆدا تـا عـەلا کـوڕی حـەزرەمی ئـەوانی ڕزگـار کـرد. خـەڵکی ڕەبیعـە لەبـەحرەین بـۆ هەڵگەڕانـەوە لـەدین هاوپـەیمان بوون و جارود و هاوڕێکانی خۆیان لەوان بەدوور گرت و لەسـەر باوەڕەکـەی خۆیـان مانەوە و وتیان: پاشایەتی دەگەڕێنینەوە بۆ مـونزەر کوڕی نـەعمان کـوڕی مـونزەر. ئەویان بە(خۆپەسـەند) نـاودەبرد. کاتێك باوەڕی هێنـا، بـەردەوام دەیـوت: مـن خـۆم دۆڕاندووە، خۆپەسەند نیم.

لەم کاتەدا حوتەم کوڕی زوبەیعە برای قەیس کوڕی سەعلەبە هـاوڕێ لەگـەڵ بـەکر کوڕی وایل هاتنەدەر و جگە لەهەڵگەڕاوەکان، بتپەرستەکانیش دەوری ئەویان گرت و ئەو بەرێکەوت و لەقەتیف و هیجر دابەزی. ئـەوان خـەڵکانی (خـەت) دانیشتوانی ئەوێ لەهۆزی (زوت) و (سەبابیحە)یان گومڕا کرد. ئـەو دەسـتەیەکی بەنوێنەرایـەتی خۆی بۆ دارین نارد و دەستەیەك بۆ جەواسا و گـەمارۆی موسـوڵمانانیاندا. لـەکاتی

گەمارۆدان زەختی لێکردن. عەبدوڵڵە کوڕی حەزەف سەبارەت بەهاوڕێکانی خۆی کەبرسیەتی ئەوانی کوشتبوو، وتی:

| | |
|---|---|
| الا ابلغ ابابكر رسولا | و فتيان المدينة اجمعينا |
| فهل لكم الى قوم كرام | قعود فى جواثا محصرينا |
| كان دمائهم فى كل فج | شعاع الشمس يغشى الناظرينا |
| توكلنا على الرحمن انا | وجدنا النصر للمتوكلينا |

واتاکەی: بۆ ئەبوبەکر و هەموو جوامێرەکانی مەدینە پەیکێك رەوانە بکەن. پێیان بڵێن: ئایا هیواتان بەزیندوومانەوی خەڵکێکی بەرێز هەیە کە لەجەواسا دانیشتوون و دوژمنان ئەوانیان گەمارۆداوە؟ دەڵێی خوێنیان لەهەر ڕێرەوێکدا، تیشکی خۆرە کەچاوی بینەران زەق دەکات. ئێمە کاری خۆمان دایە دەست خوای گەورە چوونکە بینیمان سەرکەوتن بەو کەسانە دەبڕێت کەکارەکانی خویان بەخوا دەسپێرن.

هۆکاری ئەوەی عەلا کوڕی حەزرەمی ئەوانی رزگار کرد ئەوە بوو کەئەبوبەکر ئەوی بۆ شەڕی دین هەڵگەڕاوەکان لەبەحرەین ناردبوو. کاتێك گەشتە کەنارەکانی یەمامە، سومامە کوڕی ئوسالی حەنەفی لەگەڵ موسوڵمانانی مناڵەکانی حەنیفە پەیوەستی بوون. هەروەها قەیس کوڕی عاسمی مێنقەری پەیوەستی بوو و ئەو بەهرەی لەدابەشکردنی خێرات دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) ، بەریدەکەوت، بۆی قەرەبوو کردەوە. عەمرۆ و ئێرانییەکان و سەعد کوڕی تەمیم و رەباب بەسوپایەك هاورێیەتییان دەکرد. ئەو، ئەوانی لەبیابانی دەهنەوە تێپەراند و کاتێك گەشتە ئەوێ، دابەزی و فەرمانی بەخەڵکدا شەوانە لەوێ خێوەت هەڵدەن. لەم کاتەدا وشترەکانیان بەبارەوە رەمیان کرد بەشێوەیەك نەوشتریان ما نە ئاو نەتوێشو. خەمێك دایگرتن کەئەندازەکەی تەنیا خوا دەیزانی. ئەوان پێشنیاری مەرگیان بۆ یەك کرد و بەتەواوی دەستیان لەژیان شۆرد. عەلا کوڕی حەزرەمی ئەوانی بانگکرد و لەدەوری کۆبوونەوە. وتی: ئەم خەمە چییە ئێوەی داگرتووە؟ وتیان: کوا شیاوە بۆ سەرکۆنە کردن کەئەگەر تا بەیانی زیندوو بمێنین، خۆر بەتەواوی هەڵنایەت و ئێمە هەمووومان لەناوچووین. وتی: هیچ کات ترستان لەسەر نییە چوونکە

موسوڵمانن وشەڕکەران لەرێی خوا، ورەتان بەرز و شادمان بن کەسوێند بەخوا هیچ کات پشتگوێ ناخرێن.

کاتێك بەرەبەیان هات و نوێژی بەیانیان خوێند، عەلا لەخوا پاڕایەوە و ئەوانیش پاڕانەوە و لەم کاتەدا ئاوێك لەدورەوە درەوشایەوە، بەرەو ئاوەکە رایان کرد، خواردیان و سەر و ڕوخساریان شۆرد. رۆژ نەگەشتە نیوە، وشترەکان لەهەر لایەکەوە گەڕانەوە وکەوتنە سەرچۆك و ئەوان وشترەکانیان تێراو کرد. ئەبوهورەیرە لەناو ئەواندا بوو. کاتێك لەوێ تێپەڕین بەمنجاب کوڕی راشدی وت: تۆ تا چ رادەیەك شارەزایی شوێنی ئاوەکەیت؟ وتی: شارەزام. وتی: لەگەڵ من بە تاشوێنی ئاوەکەم نیشان بدەیت و رێنوینیم بکەیت. دەڵێت: گەڕاینەوە و جگە لەکانییەکی بچوك هیچمان نەبینی. وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم گۆمە نەدەبوو، دەموت ئەمە هەمان شوێنە. من پێشتر لێرە ئاوم نەبینیوە. ئێستا بینیم مەشکەیەکی بچوك لێوانلێوە لەئاو. ئەبوهورەیرە وتی: سوێند بەخوا ئەمە هەمان شوێنە. لەبەر ئەمە گەڕامەوە و تۆم لەگەڵ خۆم گەڕاندەوە و مەشکە بچوکەکەی خۆم پڕئاو کرد و خستمە لێواری کانییەکە و وتم: ئەگەر بەخشینێك لەبەخشینەکان بێت، دەیناسیتەوە و ئەگەر کانییەك بێت، دەیزانی. ئەمە، بەخشینێکە لەبەخشینەکانی خوا و سوپاس بۆ خوا.

ئەوسا بەرەو هەجەر بەرێکەوتن. عەلا کوڕی حەزرەمی کەسی بۆ لای جارود نارد و فەرمانی پێدا لەحوتەم و دەوروبەرەی بڕواتە لای عەبدولقەیس. ئەویش لەگەڵ هاورێکانی خۆی بەرێکەوتن و لەنزیك هەجەر دابەزین. بتپەرستەکان هەموویان لەدەوری حوتەم کۆبوونەوە جگە لەخەڵکی دارین کە لەشوێنی خۆیان مانەوە. موسوڵمانان دەوری عەلا یان گرت. موسوڵمانان و بتپەرستەکان هەردووك بەدەوری خۆیان سەنگەریان هەڵکەند. لەبەرەبەیان تادرەنگانی ئێواری شەڕیان دەکرد و دواتر دەگەڕانەوە سەنگەرەکانی خۆیان. مانگێکیان بەمشێوەیە بەسەر برد. لەم کاتەدا لەناکاو هاواری شکست یا شەڕیان بیست. عەلا وەتی: کێ دەتوانێت بڕوات و هەواڵمان بۆ بێنێت؟ عەبدوڵڵە کوڕی حەزەف وتی: من. ئەو ڕۆشت تا گەشتە سەنگەری ئەوان بەلاّم ئەسیر کرا. دایکی ئەو عەجەلی بوو. ئەو

بەردەوام هاواری دەکرد ئەی ئەبجەر! ئەبجەر کوڕی بوجەیر هات و ناسییەوە و وتی: چیت بەسەر هاتووە؟ عەبدوڵڵە وتی: بۆ دەبێت من ئەسیر بکرێم لەگەڵ ئەوەی لەدەوروبەرم سوپایەك لەعجل و تەمیم و اللات و هاوشێوەکانیانە؟ ئەبجەر ئازادی کرد وپێی وت: سوێند بەخوا، گومان دەکەم تۆ خوشکەزایەکی زۆر خراپیت کەئەمشەو هاتوویتە لای خاڵۆکانت. عەبدوڵڵە وتی: چاوپۆشی بکە و خواردنێکم پێدبە کە لەبرسا مردم. ئەبجەر خواردنی بۆ هێنا، خواردی و وتی: توێشوم پێبدە و چوراپێیەك تاسواری بم. ئەم قسانەی لەگەڵ پیاوێك دەکرد بەتەواوی سەرخۆش بوو. ئەبجەر توێشوی پێدا و سواری وشترێکی کرد و لەوێ ڕۆشت. عەبدوڵڵە گەڕایەوە بۆ ناو سوپای موسوڵمانان و هەواڵی پێدان کەدوژمن هەموویان مەست و سەرخۆشن. موسوڵمانان هێرشیانکردە سەریان و بەوشێوەی دەبێت، شمشێریان لەناو دوژمندا سوڕاند. ناباوەڕان ڕایان کرد وبوون بەچەندین دەستە: سەرگەردان، یا رزگار، یا کوژراو یا ئەسیر. موسوڵمانان بەسەریاندا زاڵبوون و تەنیا توانیان بەجلەکانی خۆیانەوە رزگاریان بێت.

ئەبجەر خۆی رزگار کرد و حوتەم کوژرا. قەیس کوڕی عاسم ئەوی کوشت و ئەمە دوای ئەوە بوو کەعەفیف کوڕی مونزەری تەمیمی قاچی ئەوی بڕیبوو. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و عەفیف، مونزەری کوڕی نەعمان کوڕی مونزەری بەئەسیری گرت و باوەڕی هێنا. کاتێك بەیانی داهات، تالآنییەکانیان لەناو سوپاکەدا دابەشکرد وئەو کەسانەی تاقیکردنەوەی شەڕیان بەباشی پشت سەرنابوو، جل وبەرگیان بەدیاری وەرگرت. ئەو بەسومامە کوڕی ئوسالی حەنەفی جلێکی ڕەشی چوارگۆشەی بەخشی کەنیشانەکانی پێوە هەڵواسرابوو. ئەم جلە، هی حوتەم بوو کەشانازی پێوە دەکرد. کاتێك سومامە لەگرتنی دارین گەڕایەوە، مناڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە ئەویان بینی و وتیان: تۆ حوتەمت کوشتووە؟ وتی: من نەمکوشتووە بەڵام ئەم جلەم وەك تالآنی بەرکەوت. ئەوان هێرشیانکردە سەر و خوێنیان ڕشت.

زۆرینەی هەلآتووان مەبەستی دارینیان کرد. ئەوان بەکەشتی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕۆشتن. کەسانیتر پەیوەستی خەڵکانی خۆیان بوون. عەلا کوڕی حەزرەمی بۆ باوەڕداران لەبەکر کوڕی وایل وەك عوتەیبە کوڕی نەهاس و موسەنا کوڕی حارسە

و کەسانیتر نامەی نووسی و فەرمانیدا لەسەر هەر ڕێگایەك بۆ هەڵاتووان و هەڵگەڕاوەکان بۆسە بنێنەوە. ئەم کارەیان کرد و نێردراوەکانیان گەشتنە لای عەلا کوڕی حەزرەمی و ئەم هەواڵەیان پێراگەیاند. فەرمانیدا بەدوای ئەودا ڕەوانە ببن. لەم کاتەدا داوای لەخەڵك کرد بەرەو دارین بڕۆن و بەوانی وت: خوا نیشانەکانی خۆی لەوشکانی بەئێوە نیشاندا تا لەزەریادا وانەی لێوەربگرن. بۆ پێشەوە بەرەو دوژمن و لەپانتایی دەریاوە تێپەڕن. بەرێکەوت و ئەمانیش بەدوایدا تا سوار لەسەر ئەسپ و وشتر و کەر لەدەریایاندا. پیادەکانیش لەناو ئەواندا دەبینرا. لەخوا پاڕایەوە و ئەوان پاڕانەوە. دۆعاکانیان بەمشێوە بوو: ئەی مێهرەبانترینی مێهرەبانەکان، ئەی خوای گەورە، ئەی خۆڕاگر، ئەی تاقانە، ئەی بێ نیاز لەهەمووان کەهەمووان نیازمەندی تۆن، ئەی زیندوو، ئەی ژینبەخشی مردووان، ئەی زیندوو، جگە لەتۆ خوایەکمان نییە. ئەوان بەفەرمانی خوا لەو کەنداوە تێپەڕیان کرد و لەسەر زیخێك کەئاوی بەسەرەوە بێت و سمی وشتر دابپۆشێت، بەرێگادا ڕۆشتن. لەنێوان بەستێن تا دارین، شەو و ڕۆژێك بەکەشتی ڕێگابوو. ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە و شەڕێکی قورسیان کرد. موسوڵمانان سەرکەوتن و بتپەرستەکان شکستیان خوارد. کەسانی زۆر لەبتپەرستەکان بەدەستی موسوڵمانان کوژران بەشێوەیەك هیچ وشیارێکیان لەوان بەزیندوویی نەهێشتەوە. تالانی و ئەسیری زۆریان گرت و کاتێك لەم کارە تەواو بوون، گەڕانەوە و ئیسلام لەناوچەکە سەقامگیر و جێگیر بوو.

عەلا کوڕی حەزرەمی بۆ ئەبوبەکر نامەی نووسی و ئەوی لەشکستی هەڵگەڕاوەکان وکوژرانی حوتەم ئاگادار کردەوە. موسوڵمانان خۆپارێزێکیان لەخەڵکی هەجەر لەگەڵدا بوو کەباوەڕی هێنا. پێیان وت: بۆ باوەڕت هێنا؟ وتی: سێ هۆکار بۆ باوەڕهێنان هانیدام (ترسام ئەگەر دوای بینینی ئەوانە باوەڕ نەهێنم خوا روخسارم بۆ شێوەی ئاژەڵان بگۆڕێت: هەڵقوڵانی ئاو لەبەردەڵانی بیابان، دامرکانەوەی شەپۆلەکانی دەریا لەکاتی تێپەڕینی ئەوان و پاڕانەوە لەخوا لەناو سوپاکەی ئەوان لەبەرەبەیان بەشێوەیەك دەبیسترا لەئاسمان. ئەی خوایە تۆ مێهرەبانترینی مێهرەبانەکانی، خوایەك جگە لەتۆ نییە، تۆ هەموو شتێك ئافراندووە

و پێش تۆ هیچ شتێك نەبوو، بەردەوام هەمیشە وشیاریت، زیندوویت و هیچ کات مەرگ ناتگرێتەوە، ئافرێنەری هەموو بینراو و نەبینراوەکانی، هەر ڕۆژە و فەرمانێکی تازەت هەیە و ئاگاداری هەموو زانستێکی نەزانراوی. ئەوسا زانیم فریشتەکان تەنیا لەبەر ئەوە هاوکاری ئەم خەڵکە دەکەن چوونکە شوێنکەوتوی راستی و دروستین.

هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دواتریش ئەم قسانەیان لێدەبیست.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکی عەممان و مەهرە لەئایینی ئیسلام

سەبارەت بەمێژووی شەڕی موسوڵمانان لەگەڵ ئەم هەڵگەڕاوانە جیاوازی هەیە. کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گرتنی یەمامە و بەحرەین و یەمەن و ڕەوانە کردنی سوپا بۆ شام لەساڵی دوانزەیەم / ٦٣٣ زایینی ڕوویدا. باوکی مەعشەر و یەزید کوڕی عەیاز کوڕی جوعدوبە و باوکی عوبەیدە، محەممەد کوڕی عەمار کوڕی یاسر دەڵێن: گرتنەوەی وڵاتەکان لەدین هەڵگەڕاوەکان لەسەردەستی خالید وکەسانیتر هەموویان لەساڵی یانزەیەم /٦٣٢ زایینی ڕوویدا جگە لەشەڕی ڕەبیعە کوڕی بوجەیر کە لەساڵی سیانزەیەم /٦٣٤زایینی بوو هەواڵ بەخالید گەیشت کەرەبیعە لەموسەیخ و حەسید لەناو ژمارەیەکی زۆر لەهەڵگەڕاوەکاندایە. خالید شەڕی لەگەڵ کرد، تالأنی و ئەسیری زۆری گرت و یەکێك لەکچەکانی ڕەبیعەی ئەسیری خۆی کرد و ناردییە لای ئەبوبەکر کە ئەو جوان ڕوخسارەیان بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخشی.

## ١ - عەممان

لەعەممان زوئەلتاج لەقیت کوڕی مالکی ئەزدی قوت بوویەوە. ئەو لەرۆژگاری جاهلی شانازی بەجۆلۆندییەوە دەکرد. هەمان بانگەشەی کرد کەپێغەمبەرە درۆزنەکانیتر کردیان. بەسەر عەممان زاڵبوو و لەئیسلام هەڵگەڕایەوە. جەیفەر و عەیاز پەنایان بۆ کوێستانەکان برد. جەیفەر پەیك و پەیامی بۆ ئەبوبەکر نارد و لەو ڕووداوە ئاگاداری کردەوە و داوای هاوکاری لێکرد. ئەبوبەکر، حوزەیفە کوڕی میحسەنی غەلفانی لەحەمیر ڕەوانە کرد هەروەها عەرەفجەی بارەقی لەئەزد. حوزەیفەی بۆ عەممان نارد و عەرەفجەی بۆ مەهرە. ووتی: هەرکام لەسەرزەمینی خۆی فەرماندەی ئەویتر بێت. کاتێك لەعەممان نزیك بوونەوە، بۆ جەیفەر نامە بنوسن. حوزەیفە بەرەو عەممان بەڕێکەوت. ئەبوبەکر بۆ عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل کەناردبووی بۆ یەمامە و شکستی خواردبوو، پەیامی نارد تا پەیوەستی حوزەیفە و عەرەفجە بێت و هاوڕێکانی خۆی هەڵگرێت و لەبەرابەر خەڵکی عەممان و مەهرە هاوکاری ئەم دووانە بکات. کاتێك لەم کارە تەواو بوون، ئەو بەرەو یەمەن بڕوات. عێکرەمە پێش گەیشتن بەعەممان، پەیوەستی ئەم دووانە بوو و کاتێك گەشتنە ڕێجام، گوندێگی نزیکی عەممان، نامەیان بۆ جەیفەر و عەیاز نووسی. لەقیت سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و لەدەبا خێوەتی هەڵدا. جەیفەر و عەیاز هاتنەدەر و لەسوحار ئوردوویان لێدا و کەسیان بۆ لای عێکرەمە و حوزەیفە و عەرەفجە نارد و داوایان کرد پەیوەستیان بن. ئەوان نامەیان بۆ گەورەکانی لەقیت نووسی و خەڵکانیان لەدەوری ئەو بڵاوە پێکرد. دواتر لەدەبا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورسیان تاقیکردەوە. لەقیت سەرکەوتنی بەدەست هێنا و موسوڵمانان لەناو خۆیاندا لاوازی و دووبەرەکیان بینی و بتپەرستەکان سەرکەوتن. لەوکاتەی بەم شەڕەوە سەرقاڵ بوون، هێزی پشتیوانی موسوڵمانان لەمناڵەکانی ناجییە بەفەرماندەیی خریت کوڕی ڕاشد و عەبدولقەیس بەفەرماندەیی سەیحان کوڕی سوحان وکەسانیتر فریایان کەوتن و خواوەند، موسوڵمانانی بەهێز کرد. بتپەرستەکان هەڵاتن و لەم شەڕەدا دەیان هەزار کەسیان لێکوژرا. سوپای ئیسلام

هێرشیانکردە سەریان و کوشتاریان کردن و ژن و منداڵەکانیان بەئەسیری گرت وپێنج یەکیان بەعەرەفجە بۆ ئەبوبەکر نارد. حوزەیفە لەعەممان مایەوە تاخەڵك ئارام بکاتەوە.

## ٢--- مەهرە

گێڕانەوەکان سەبارەت بەمەهرە بەمشێوەیە: کاتێك عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل لەعوممان تەواو بوو، لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی لەعەبدولقەیس و راسب وسەعد و ناجییە بەرەوان ئەوان ڕۆشت و لەناو سەرزەمینی مەهرە هێرشیکردە سەریان. لەوێ ڕووبەڕووی دوو سوپا لەمەهرە بوویەوە یەکیان لەژێر فەرماندەیی پیاوێك لەوان بەناوی سێخریت و یەکیتریان لەژێر فەرماندەیی کەسێك لەمناڵەکانی مەحاریب بەناو و نیشانی موسەبەح. زۆربەی خەڵك لەگەڵ ئەودا بوون. ئەم دووانە پێکەوە ناسازگار بوون. عێکرەمە بۆ سێخریت نامەی نوسی و داوای لێکرد باوەڕ بێنێت و رازی بوو. بۆ موسەبەح نامەی نوسی نامەی نووسی و داوای لێکرد باوەڕ بێنێت کەرازی نەبوو. بەقورسی شەڕی لەگەڵ کرد. هەڵگەڕاوەکان شکستیان خوارد و ڕێبەرەکەیان کوژرا. موسوڵمانان شمشێریان لەناو ئەواندا سوڕاند و ئەوەی دەیانویست وەك تالآنی هەڵیان گرت. پێنج لەسەر یەکیان لەگەڵ سخریت ناردە لای ئەبوبەکر. عێکرەمە و سوپاکەی لەهێزە پشتیوانەکان کەلوپەلی شەڕ و کالآیان بەرکەوت و بەهێز بوون. عێکرەمە مایەوە تا فەرمانەکانی جێبەجێکران و بەیعەتیان کرد.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکی یەمەن لەئایینی ئیسلام

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەم کەسانە لەلایەن پێغەمبەرەوە فەرمانداری شار و هۆز و پانتاییە جۆراوجۆرەکان بوون: فەرمانداری مەککە و سەرزەمینەکانی عەتاب کوڕی ئوسەید، فەرمانداری عەك و ئەشعەرییەکان تاهیر کوڕی باوکی هالە، فەرمانداری تایف عوسمان کوڕی ئەبی عاس و مالك کوڕی عەوف نەسری (عوسمان لەسەر شارەکان و مالك لەسەر گوندەکان)، فەرمانداری سەنعا فیروز و دادویە و قەیس کوڕی مەکشوح، فەرمانداری جەنەد یەعلی کوڕی ئومەییە و فەرمانداری مارب ئەبو موسا ئەشعەری. کاتێك خوا ئەسوەدی عەنسی لەناو برد، دەستەیەك لەهاوڕێیانی ئەو دوودڵ مانەوە و لەنێوان نەجران و سەنعا هاتوونچۆیان دەکرد و پەنایان بۆ کەس نەدەبرد. بەدوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) مرد وخەڵك لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە. عەتاب کوڕی ئوسەید بۆ ئەبوبەکر نامەی نووسی و ئاگاداری کردەوە کە چ کەسانێك لەسنوری فەرمانڕەوایی ئەو لەدین هەڵگەڕاونەتەوە. عەتاب براکەی خۆی خالید کوڕی ئوسەیدی بۆ جەنگی خەڵکی تەهامە ڕەوانە کرد کەچەندین دەستە لەمودلج و خوزاعە و منداڵەکانی کەنانە لەوێ بەسەریان دەبرد.

فەرمانڕەوایی کەنانە جەندەب کوڕی سەلەما بوو. ئەوان ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و خالید ئەوانی کوشتار کرد و بڵاوەی پێکردن. جەندەب رایکرد و گەڕایەوە. عوسمان کوڕی ئەبی عاس لەشکری بۆ شنوئە نارد کەلەوێ ئەزد و خەسعەم و بێجیلە دەژیان و حومەیسە کوڕی نەعمان فەرمانڕەوایەتی ئەوانی دەکرد. عوسمان، عوسمان کوڕی ئەبی ڕەبیعەی کردە فەمانڕەوایی سوپاکە. ئەوان لەشنوئە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ناباوەڕان شکستیان خوارد و هەڵاتن و بڵاوەیان لێکرد و حومەیسە ڕایکرد.

بەڵام ئەخابسی ئەزعەك، یەکەم کەسان بوون دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەتەهامە پەیمانشکێنیان کرد. دواتر عەك و ئەشعەرییەکان کۆبوونەوە و لەسەر ئەعلاب مانەوە. تاهیر کوڕی باوکی هالە هاوڕێ لەگەڵ مەسروق و خەڵکەکەی لەعەك

لەباوەڕداران، بۆ جەنگی رەوانە بوون. ئەوان لەئەعلاب ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. عەك و هاوەڵانیان شکستیان خوارد و کوشتار کران. ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بوو. نامەی ئەبوبەکر بۆ تاهیر گەیشت و فەرمانی شەڕی لەگەڵ ئەوان دەدا. ئەو، ئەوانی بە ئەخابس (ناخ پیسەکان) ناو برد و رێگەی ئەوان بەرێی ئەخابس. ئەم ناوە تا ئێستا لەسەر ئەوان ماوەتەوە.

بەلاّم خەڵکی نەجران، کاتێك هەواڵی مردنی پێغەمبەریان پێگەیشت، دەستەیەکی نوێنەرایەتی خۆیان بۆ لای ئەبوبەکر نارد و پەیمانی خۆیان تازە کردەوە. ئەبوبەکریش نامەیەکی بۆ نووسین.

بەلاّم بێجەیلە، ئەبوبەکر جەریر کوڕی عەبدوڵڵەی گەڕاندەوە و فەرمانی پێدا لەناو خەڵکەکەی، ئەوانەی وەك باوەڕدار ماونەتەوە، کۆبکاتەوە و بەهاوکاری ئەوان لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان شەڕ بکات. ئەو دەبێت بەرەو خەسعەم ڕەوانە بێت و شەڕی زی خەلسە و هەڵگەڕاوەکان بکات. جەریر ڕۆشت و فەرمانەکانی جێبەجێ کرد بەلاّم جگە لەدەستەیەکی کەم ڕووبەڕووی نەبوونەوە. ئەوانی کوشتار کرد و شوێنیان کەوت.

## دووەم هەڵگەڕانەوەی خەڵکی یەمەن لەئایینی ئیسلام

لەناو ئەو کەسانەی بۆ دووەم جار لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە، قەیس کوڕی عەبد یەغوس کوڕی مەکشوح بوو. کاتێك هەواڵی مردنی پێغەمبەری پێگەیشت، هەوڵیدا فیروز و جێشنەس بکوژێت. ئەبوبەکر نامەی بۆ ئەمانە نووسی: عومەر زی موران، سەعید زی زود، زی ئەلکەلاع، حەوشەب زی زولەیم و شەهری زی نیاف. فەرمانی پێدان پێبەندی دینەکەی خۆیان بن و هاوکاری ئێرانییە باوەڕدارەکان لەبەرابەر هەڵگەڕاوەکان بکەن و گوێ لەوتەکانی فیروز بگرن. پێشتر، فیروز و قەیس و دادویە هاودەست و هاوکار بوون. کاتێك قەیس ئەم هەواڵەی بیست، نامەی بۆ زی ئەلکەلاع و هاوڕێیانی نووسی و داوای لێکردن ئێرانییە باوەڕدارەکان و کەسەکانیان لەیەمەن بکوژن و دووریان بخەنەوە. ئەوان بەداواکەی رازی نەبوون و هاوکاری ئێرانییە باوەڕدارەکانیشیان نەکرد. قەیس بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان خۆی

ئامادە کرد و بۆ هاوەڵانی ئەسوەد عەنسی کەدوودڵ بوون و بەنهێنی لەو سەرزەمینە دەژیان، نامەیەکی نهێنی نووسی و داوای لێکردن لەدەوری ئەو کۆببنەوە. ئەوان هاتن. خەڵکی سەنعا چاوەڕوانی ئەم کارەیان دەکرد. قەیس مەبەستی فیروز و دادویەی کرد و بەفێڵ، راوێژی لەگەڵ کردن تا مەبەستەکەی لەم دووانە بشارێتەوە. ئەم دووانە باوەڕیان پێی کرد و پەیوەستی بوون. بۆ بەیانی قەیس خورادنێکی دروست کرد و فیروز و جێشنەس و دادویەی بانگ کرد. فیروز هات و کاتێك نزیکبوویەوە، وتاری دوو ژنی بیست، دەیانوت: ئەم پیاوە وەك دادویە دەکوژرێت. ئەو هەڵات. هاوەڵانی قەیس شوێنی کەوتن. دەستی بەڕاکردن کرد. جێشنەس ئەوی بینی و لەگەڵی گەڕایەوە و هەردووك ڕوویانکردە کوێستانەکانی خەولان. خەڵکی ئەم ناوچەیە خاڵەکانی فیروز بوون. هەردووك ڕۆشتنە سەر چیاکە. سوارەکانی قەیس گەڕانەوە و ئاگاداریان کردەوە. ئەو لەسەنعا و دەورووبەری شۆڕشی کرد و سوارەکانی ئەسوەد عەنسی پەیوەستی بوون.

لەدەوری فیروز دەستەیەك لەخەڵك کۆبوونەوە. بۆ ئەبوبەکر نامەی نووسی و ئاگاداری کردەوە. لەدەوری قەیس چەندین هۆز کۆبوونەوە وئەمانە، ئەوانە بوون ئەبوبەکر نامەی بۆ گەورەکانیان نوسیبوو. گەورەکانیان لەدوورەوە وەستا بوون. قەیس ڕوویکردە جوامێرە ئێرانییەکان و ئەوانی بۆ سێ دەستە دابەشکرد: ئەوانەی مانەوە و بنەماڵەکانی ئەوانی هێشتەوە، ئەوانەی لەگەڵ فیروز ڕۆشتن و بنەماڵەکانی ئەوانی کردە دوو دەستە: دەستەیەکی نارد بۆ عەدەن تا لەرێگەی دەریاوە ببرێن و دەستەیەکی لەرێگەی وشکانییەوە ڕەوانە کرد وبەهەموویانی وت: بگەڕێنەوە بۆ سەرزەمینەکانی خۆتان.

کاتێك فیروز بەمەی زانی، بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەو کەوتە جموجۆڵ و خۆی لەهەر بوارێکەوە ئامادە کرد وبۆ مناڵەکانی عەقیل کوڕی رەبیعە کوڕی عامر و عەك نامەی نووسی وداوای هاوکاری لێکردن. خەڵکی عوقەیل سوار بوون و ڕووبەڕووی سوارەکانی قەیس کوڕی عامر بوونەوە و مناڵ و کەسانی جوامێرە ئێرانییەکانیان لەگەڵدابوو. ئەوانیان رزگار کرد و سوارەکانی قەیسیان کوشتار کرد. دووبارە

عەکییـــەکان ڕەوانـــە بـــوون و دەســـتەیەکیتر لەبنەماڵـــە ئێرانییـــەکانیان ڕزگـــار و پیاوەکـانی قەیـسیان کوشـتار کـرد. خـەڵکانی عوقـەیل و عـەك بـەناردنی پیـاوە شـەڕکەرەکان، هاوکـاری فیروزیـان کـرد، کاتێـك هاوکارییـەکانی پێگەیـشت، لەگـەڵ ئـەوان و ئـەو کەسـانەی لـەدەوری خـۆی کۆببوونـەوە، ڕۆشـتەدەر. لەشـوێنێك نزیـك بەسەنعا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شـەڕێکی قورس ڕوویـدا. قەیس و هاوڕێکانی شکستیان خوارد وهاوەڵانی ئەسوەد عەنسی سەرگەردان و پەرێشان بوون و قـەیس و هاوەڵانی لەرێگەی نێوان سەنعا تانەجران بێ دەرەتان مانەوە.

دەســـتەیەك دەڵـــێن: فـــەروە کـــوڕی موســـەیەك هـــاتبووە لای پێغەمبـــەر(د.خ) و پێغەمبـــەر(د.خ) ئـــەوی بـــۆ کۆکردنـــەوەی خێـــر و زەکـــاتی هۆزەکـــانی مـــوراد و دراوسێکانی دیاری کردبوو.

عـــەمرۆ کـــوڕی مەعـــدی کـــەربی زوبەیـــدی لەخـــەڵکی خـــۆی سەعدئەلعەشـــیرە جیابببوویەوە و پەیوەستی موراد ببوو و لەگەڵ ئەوان باوەڕی بەئیسلام هێنا. کاتێك ئەسـوەد عەنـسی و هاوڕێیـانی ئـەو لەمێزجەحییـەکان، لەئیـسلام هەڵگەڕانـەوە، عـەمرۆیش هەڵگەڕایـەوە. عـەمرۆ کوڕی مەعدی کـەرب لەگـەڵ خالیـد کـوڕی سـەعید کوڕی ئـەلعاس بـوو. کاتێك عـەمرۆ لـەدین هەڵگەڕایەوە، خالیـد ڕۆشـت و شمـشێری لەگەردنیدا. عەمرۆ لەبەرابەر ئەو ڕایکرد و خالید شمشێرەکەی بەناوی (سەمسامە) و ئەسپەکەی لێسەند. کاتێك عەمرۆ هەڵگەڕایەوە، ئەسوەد عەنسی ئـەوی لەبەرابـەر فـەروە جـێ کـردەوە. هـەر کـام لـەم دووانـە لەشـوێنەکەی خۆیـان مانـەوە و کەسـیان ئامادە نەبوو، جێگەی خۆی بەویتر بسپێرێت. ئـەوان لەسـەر ئـەم مەبەسـتەی خۆیـان بەردەوام بوون تا عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل لەمەهرەوە گەیشتە ئەبیەن و لەشـەڕی مـــەهرە ئامـاژەمـــان پێـدا. ئـەو دەسـتەیەکی زۆری لەخـەڵکانی مـەهرە لەگەڵـدابوو. نەخەعیبەکان و حەمیریبیەکان بێ گوناح هەژمار کران. هەروەها موهاجیر کوڕی ئەبی ئومەییە لەگەڵ دەستەیەك لەمەککە و تایف و بێجەیلە هاورێ لەگەڵ بوجەیر گەشتە نـەجران. فـەروە کوڕی موسـەیەکی مـورادی پەیوەسـتی بـوو. عـەمرۆ کوڕی مەعدی کـــەرب لەکردەکـــەی خـــۆی پەشـــیمان بوویـــەوە و بـــەدەم داوای لێبووردنـــەوە، بـــێ وەرگـرتنی ئـەمان، ڕۆشـتە لای موهـاجیر. موهـاجیر ئـەوی زنـدانی کـرد. هـەروەها

قەیسی گرت و ئەم دووانەی دەست وپێ بەستراو نارده لای ئەبووبەکر. ئەبوبەکر وتی: ئەی قەیس، بەندەکانی خوات کوشت و لەهەڵگەڕاوەکانت وەك پشتیوانی خۆت هەڵبژارد! قەیس حاشای کرد لەکوژرانی دادویە بەشدار بێت. ئەوی بەنهێنی کوشتبوو. ئەبووبەکر لەخوێنی ئەو خۆش بوو و بەعەمرۆی وت: ئایا شەرم ناکەیت بەردەوام یا هەلاتوویت یا ئەسیری؟ ئەگەر هاوکاری ئەم دینە بکەیت، خوا لەبەرەکەتی ئەم دینە پێگەت پێدەبەخشێت. عەمرۆ وتی: بێ چەند وچون بەم ئامۆژگارییە رازی دەبم و هەرگیز ڕووناکەمە گوناحکاری وپەیمانناشکێنم. ئەم دووانە بۆ لای هۆزەکانی خۆیان گەڕانەوە. موهاجیر بەرەو نەجران ڕۆشت و سوارەکان هێرشیانکردە سەر هاوەڵانی ئەسوەدعەنسی. ئەوان داوای ئەمانیان کرد بەلام پێیان نەدرا و لەهەر ڕێڕەو و شوێنێك کوشتاریان کردن. دواتر ڕوویکردە سەنعا و ڕۆشتە ناوی و ئەم هەواڵانەی بەئەبووبەکر راگەیاند.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکی حەزرەمەوت و کندە لەئیسلام

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، فەرمانڕەواکانی ئەو لەسەرزەمینەکانی حەزرەمەوت ئەمانە بوون: زیاد کوڕی ئەبی لەبیدی ئەنساری فەمانڕەوایی حەزرەمەوت، عوکاشە کوڕی ئەبی ئومەییە فەمانڕەوایی سەکاسك و سەکون و موهاجیر کوڕی ئەبی ئومەییە فەمانڕەوایی کندە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی دیاری کرد بەلام نەڕۆشتە سەر کارەکەی خۆی تا پێغەمبەر(د.خ) مرد. ئەبوبەکر ئەوی ڕەوانەی شەڕی هەڵگەڕاوەکان لەیەمەن کرد و فەرمانی پێدا دوای ئەوە بڕواتە سەر کارەکەی. ئەو لەشەڕی تەبووك هاوڕێیەتی پێغەمبەری نەکرد. پێغەمبەر(د.خ) کە لەشەڕی تەبووك گەڕایەوە، لەوسەرگەردان بوو. ڕۆژێك دایکی سەلمە سەری پێغەمبەری دەشۆرد، وتی: چ سود لەم ژیانە کەتۆ لەبراکەی من ناڕازی بیت. ئەو زانی پێغەمبەر(د.خ) دڵی نەرم بووە. خزمەتکارەکەی خۆی بانگ کرد. بەردەوام لای پێغەمبەر(د.خ) دەپاڕایەوە و لێبوردنی ئەوی بیردەخستەوە تا ئەوەی لێی رازیبوو و کردی بەفەمانڕەوای کندە. پێغەمبەر(د.خ) مرد وئەو نەڕۆشتبووە سەرئەرکەکەی و دواتر ڕۆشت.

هۆکاری هەڵگەڕانەوەی کەندییەکان لەئیسلام و شوێنکەوتنی ئەوان بۆ پیاوێکی درۆزن (تا ئەو شوێنەی پێغەمبەر(د.خ) چوار پاشاکەی ئەوانی نفرین کرد) ئەوە بوو کاتێـك باوەڕیـان هێنـا، پێغەمبـەر(د.خ) فـەرمووی بەشـێك لـەخێر و زەکـاتی حەزەرمـەوت بەکنـدە بسپێردرێت و بەشێك لـەخێر و زەکـاتی کنـدە بەحەزەرمـەوت، بەشێك لـەخێر و زەکـاتی حەزەرمـەوت بەسـەکن و بەشێك لـەخێر و زەکـاتی سـەکون بەحەزەرمەوت. لەبەر ئەمە دەستەیەك لەمناڵـەکانی وەلیعە لەکندییـەکان بەخـەڵکانی حەزەرمەوتیان وت: ئێمە چوارپێمان بۆ سواربوون نییە، باشترە خێرەکانی خۆتـان لەسەر چوارپێ بۆ ئێمە بنێرن. وتیان: لێکۆڵینەوە دەکەین ئەگەر چوارپێتان نـەبێت، بۆتان دەنێرین. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، مناڵـەکانی وەلیعە وتیـان: ئـەو بەڵێنـەی بەپێغەمبەرتانـدا، بەئـەنجامی بگـەیێنن. وتیـان: ئێـوە چـوارپێتان بـۆ هەیـە، سـوار چـوارپێکانی خۆتـان بـن و بارەکـانی خۆتـان بـەرن. ئـەوان بـەزیادیان وت: تـۆ هاودەستی ئەوان و دوژمنی ئێمـەیت. خـەڵکی حەزەرمـەوت خۆڕاگری و کندییـەکان پێـداگریان کـرد وبـۆ سـەرزەمینەکانی خۆیـان گەڕانـەوە و لـەم کـارەدا سـەرگەردان بوون. زیاد چاوەڕوانی هـاتنی موهـاجیری دەکـرد و دەسـتی لـەوان هـەڵگرت. کاتێـك موهـاجیر لەشـار دوورکەوتبوویـەوە، زیـادی لەجێگـەی خـۆی دانـابوو. موهـاجیر لەشـاری سـەنعا ڕۆشـتە سـەرکارەکەی خـۆی و عێکرەمـە کـوڕی ئـەبی جـەهلیش. یـەکیان هێرشیکردە سـەر ئەسـوەد عەنسـی وئـەویتریان بـۆ سـەر هـۆزی وایل. زیاد کوڕی لەبید خێر و زەکاتی مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی معاویەی بەدەستی خـۆی لـەوان وەرگرتبـوو. ئـەو ڕۆشـتە لای ئـەوان. یەکـەم کـەس لـەوان کەڕووبـەڕووی بوویـەوە، شـەیتان کـوڕی حـوجر بـوو. ئـەو وشـترێکی گـەنجی ئـەوانی هـەڵگرت و داغـی کـرد. بینی وشترەکە خاوەنەکەی عەدا کوڕی حوجر برای شەیتان کوڕی حوجرە. براکەی لەکاتی وەرگرتنی ئەم وشترە گومانی لا دروست ببوو. ناوی ئەو وشترە (شـزرە)بـوو کەگومانی دەبرد وشترێکیترە. عەدا وتی: ئەمـە وشـتری منـە. شـەیتان وتـی: ڕاسـت دەکات بەرەڵای بکە و یەکیتر هەڵبگرە. زیاد تۆمەتی ناباوەڕی و دووری لەئیسلامی خستە پاڵ. ئەو ئەم دووانەی لەوشترەکە دوورخستەوە و وتـی: وشـترەکە، وشـتری خوایـە و مـافی ئێـوەی بەسـەرەوە نـەماوە. ئـەو دووانـە بـۆ وەرگـرتنی وشـترەکە

پێداگریان کرد. پێی وتن: نەکات شەزرە وەك بەسوس بۆ ئێوە شوم بێت. عەدی هاواری کرد: ئای بنەماڵەی عەمرۆ، ستەم دەکەن و لەناوم دەبەن! بەدبەخت و ڕیسوا ئەو کەسەیە لەماڵەکەی خۆی سەرکوت بکرێت! ئەو هەروەها حارسە کوڕی سەراقە کوڕی مەعدی کەربی بانگ کرد. ڕوویکردە زیاد و زیاد وەستابوو. پێی وت: وشتری گەنجی ئەم پیاوە بەرەڵا بکە و یەکیتر هەڵبگرە. زیاد وتی: هیچ ڕێگەیەك لەم کارەدا نییە. حارسە وتی: ئەمە کاتێك بوو تۆ جوولەکە بوویت. ئەو هەوساری وشترەکەی گرت و دووری خستەوە و لەبەرابەریا وەستا. زیاد فەرمانی بەچەند گەنجێکی سەکون و حەزەرمەوت دا ئەوانیان گرت وشانیان بەستن و وشترەکەیان گرتەوە. کندییەکان هاواریان کرد و مناڵەکانی معاویە تووڕە بوون و پشتیوانیان لەحارسە کرد. لەم ناوەدا دوو سوپای گەورە کۆبوونەوە. مناڵەکانی معاویە لەترسی گیانی ئەسیرەکانیان هیچیان نەکرد و هاوەڵانی زیاد بیانویان دەست نەکەوت تا هێرشیان بکەنەسەر. زیاد فەرمانی پێدان شمشێرەکانیان دابنێن بەڵام ڕازی نەبوون. خوازیاری ئازادی ئەسیرەکانی خۆیان بوون کەرازی نەبوو. شەوانە هێرشیکردە سەریان و کوشتار و بڵاوەی پێکردن. کاتێك بڵاوەیان کرد، حارسە و هاورێکانی ئازاد کرد. کاتێك ئەسیرەکان بۆ لای هاورێکانی خۆیان گەڕانەوە، ئەوانیان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ زیاد هاندا. لەوان لەشکرێکی گەورە کۆبوویەوە و هاواری نەدانی زەکاتیان بەرز کردەوە. ئەو حسەین کوڕی نەمیری بۆ سەرکوت کردنیان ڕەوانە کرد. ئەوان لەشەڕ لەگەڵ یەك ئارام بوونەوە و ماوەیەك چاوەڕوانیان کرد و زۆر نەمانەوە.

دواتر مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی معاویە لەکندە، لەپاسگاکانی (مەحاجر) دابەزین ئێرە، ئەو شوێنە بوو کردبوویانە شوێنی پارێزگاری کردن لەخۆیان: جەمەد لەپاسگایەك، مێخوەس لەبازگەیەك، مێشرەح لەبازگەیەك، ئەبزەعە لەبازگەیەك و عەمرەدە لەبازگەیەك. ئەوان پاشا چوارینەکان یا ڕێبەرانی عەمرۆ بوون کەپێغەمبەر(د.خ) نفرینی کردبوون. پێشتر ئاماژەمان پێدان. مناڵەکانی حارس کوڕی معاویە لەشوێنەکانی خۆیان دابەزین: ئەشعەس کوڕی قەیس لەبازگەیەك و سمت کوڕی ئەسوەد لەبازگەیەك. هەموو مناڵەکانی معاویە لەسەر نەدانی زەکات

هاودەست بوون جگە لەشەرەحبیل کوڕی سمت وکوڕەکەی کەئەم دووانە بەمعاویەیان وت: بۆ پیاوە ئازادەکان کارێکی ناشیرینە بەردەوام بیروراکانیان بگۆڕن. رێزداران لەسەر گومان دەمێننەوە و لەترسی ڕیسوایی بەرەوە ڕووی شتێك ئاشکراتر و ڕوونتر لەوەیش، هەنگاو نانێنە پێش چ بگات بەوەی لەکارێکی باشە بەرەو خراپە و ناڕاستی بڕۆن. ئەی خوایە، ئێمە لەم کارەدا هاوکاری خەڵکەکەی خۆمان ناکەین. هاوڕێ لەگەڵ زیاد و هاوڕێ لەگەڵ ئەم دووانە، ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی عابس هاتە لای ئەمان. ئەو دووانە بەزیادیان وت: لەناکاو هێرش بکەرە سەر ئەم خەڵکە چوونکە چەندین دەستە لەسەکاسك و سەکون و هەلاتوانی حەزەرمەوت پەیوەستیان بوون. ئەگەر ئەو کارە نەکەیت، ترسی ئەوەمان هەیە خەڵك لەدەوری ئێمە بلاوەی لێبکەن وپەیوەستی ئەوان بن. ئەو رازی بوو لەناکاو هێرشیان بکاتەسەر. کۆبوونەوە و لەشوێنەکانیان هێرشیان کردنەسەر و بینیان لەدەوری ئاگرەکانی خۆیان کۆبوونەوە. لەپێنج لاوە هێرشیان کردەسەر منالەکانی عەمرۆ کوڕی معاویە کەهێزێکی فراوان و بەشکۆی زۆر لەناو ئەوان دەبینرا. میشرەح و میخوەس و جەمد وئەبزەعە و هاوتاکەیان عەمرەدیان، لەناو برد و نفرینی پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی گرتەوە. کوشیتان و لەم کارەدا لەئەندازە تێپەڕین. هەرکەس توانای ڕاکردنی بوو، هەلات. زیاد کوڕی لەبید بەئەسیر و سامانی زۆر گەڕایەوە. ئەو لای ئەشعەس تێپەڕی. ئەشعەس خەڵکەکەی خۆی لەزیان رزگار کرد و دەستەیەکی زۆر کۆکردەوە.

زیاد بۆ موهاجیر نامەی نووسی و بۆ شەڕ هانیدا و داوای هاوکاری لێکرد. نامە لەرێگا بەدەستی گەیشت وئەو عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهلی وە جێگری خۆی دەستنیشان کرد و بۆ هاندانی خەڵك پەلەی کرد و ڕۆشتە لای زیاد و بەرەو کندە ڕۆشت. دوو سوپا لەزورقان ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕیان کرد. کندییەکان شکستیان خوارد وکوشتار کران و هەلاتن و پەنایان بردە نوجەیر کەتازە ئاوەدانیان کردبوویەوە. موهاجر شوێنیان کەوت و لای ئەوان دابەزی. کەندییەکان لەنەجیر کۆبوونەوە و لەوێ قلایان گرت و موسلمانەکان گەمارۆیاندان. عێکرەمەیش خۆی بەوان گەیاند. بازنەی گەمارۆدان بەسەر کندییەکان و کەسانیتر تەسك

بوویــەوە و ســوپاییەکان بــۆ شــەڕی ئــەوان ڕۆشــتن و ئــەوانیان کوشــتار کــرد. دانیــشتووانی قــەڵا نــەجیر لەکندییــەکان و کەســانیتر، ڕووبــەڕووی موســوڵمانەکان بوونەوە. کوشتار لەناو ئەواندا زیادی کرد. گەڕانـەوە نـاو قـەڵاکان و دڵیـان نائـارم و ترسـیان لـێ نیـشت و لـەکوژران ترسـان و گـەورەکانیان تـرس کەوتـە دڵیانـەوە. ئەشعەس لەگەڵ نۆ کەس ڕۆشتە لای زیاد و داوای کرد خۆیان و بنەماڵەکەیان پەنا بدات تا دەرگای قەڵاکەی بۆ بکەنەوە. زیـاد رازی بـوو و وتـی: ئـەوەی دەتانـەوێت، بینوسن و بیهێنن تا مۆری بکەم. ئەوان پەیمانەکەیان نووسی. ئەشعەس بیری چوو ناوی خۆی لـەناو پـەیمان نامەکـەدا بنوسێت چوونکە جەحدەم پەلاماریـدا، کێردی دەرکێشا و وتـی: نـاوی مـن دەنووسـی یـا بتکـوژم؟ ئەو نووسـی و خـۆی لـەبیر کـرد. ئـەوان دەرگاکـەیان کـردەوە و موسـوڵمانەکان ڕۆشـتنە نـاو و هـیچ شـەڕکەرێکیان نەهێــشتەوە و هــەموویان کوشــت. بەئەشــکەنجەوە لەملیانــدان و ئەســیرەکان و سامانەکانیان هـەڵگرت. کاتێـك لـەم کـارە تـەواو بـوون، ئەشـعەس وئـەو نۆکەسـەیان بانگ کرد ( و نامەکـە بەئەشـعەس بـوو) و ئـەوانیان یـەك یـەك بـانگ کـرد و زیـاد ئـەو کەسـانەی ناویـان نوسـرابوو، پەنایـدان. بـینی نـاوی ئەشـعەس لـەناو پەیمانەکـەدا نییە. موهاجیر وتـی: ئـەی دوژمـنی خـوا، سوپاس بۆ خـوا کەخوا نـاوی خـۆتی پـێ لەبیر کردی. مـن بـەردەوام ئـارەزوم بـوو خـوا تـۆ ڕیـسوا و سـوك بکـات. شـانی ئـەوی بەست. پێی وترا: ئێستا مەیکوژە و بینێرە بۆ لای ئەبوبەکر و ئەو باشتر دەزانێت چ فــەرمانێك لــەبارەی ئــەو دەربکــات. موهــاجیر لەگــەڵ ئەســیرەکان ئــەوی بــۆ لای ئەبووبەکر نارد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێـك بازنـەی گـەمارۆدان لەسـەر دانیـشتووانی نـەجیر تەسـك بوویـەوە، ئەشـعەس هاتـە لای زیـاد و موهـاجیر و موسـوڵمانان و لـەوان بـۆ خـۆی و سـامانەکەی ئـەمانی ویـست تـا بڕواتـە لای ئەبوبـەکر و ئەبوبـەکر بۆچـوونی خـۆی سەبارەت بەو ئاشکرا بکات، لەبەرابەر ئەوەی درگای قـەڵای نـەجیریان بـۆ بکاتـەوە و دانیشتوانی ئەوێ تەسلیم بکات. ئەو خیانەتی لەهاوەڵانی خـۆی کـرد. موسـوڵمانان بەمـە رازی بـوون و ئـەو قەڵاکـەی بـۆ کردنـەوە. موسـوڵمانان گـەورەکانیان ئـەوانیان بەند کـرد و کوشـتاریان کـردن و ئەشعەسیان بەسـتەوە و هـاوڕێ لەگـەڵ ئەسیرەکان

ڕەوانەی لای ئەبووبەکریان کرد. موسوڵمانان نفرینیان کرد و ئەسیرەکانیش. ژنانی خەڵکەکەی ئەویان بە (یاڵی ئاگر) ئاگر خۆشکەرە بۆ بینەران لەلایەن دوژمنەوە ناوبرد کە لەزمانی ئەواندا بەمانای خیانەتکارە. کاتێك هاتە مەدینە، ئەبوبەکر پێی وت: گومان دەکەیت چیت لێ دەکەم؟ وتی: نازانم. ئەبوبەکر وتی: ئێستا دەتکوژم. ئەشعەس وتی: من بووم لەگەڵ دەکەسیتر ئەم خەڵکەمان فریودا و ئەفسونمان کردن و دەستەمۆ و لەبەر ئەمە ڕشتنی خوێنی من ڕەوا نییە. ئەبوبەکر وتی: ئاشتی دوای مۆرکردنی پەیمان نامە، بووبەفەرمانێکی پێویست و هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کەناویان لەپەیمان نامەکەدا هاتووە و تۆ پێش ئەوە ئارام بوویت. چوونکە لەمردن ترسا وتی: ئایا هیچ باشەیەك لەمندا نابینیت کەئەسیرەکان ئازاد بکەیت و من ببەخشیت و لەهەڵەی من خۆشبیت و ئەو کارەم لەگەڵ بکەیت کەلەگەڵ کەسانیتر کردت و هاوسەرەکەم بۆ بگەڕێنیتەوە؟ ئەو لەکاتی هاتن بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) دایکی فەروە خوشکی ئەبوبەکری خوازبێنی کردبوو و بردنی ئەوی بۆ ماڵی خۆی دواخستبوو تا ئەو کاتەی دووبارە بۆ مەدینە دەگەڕێتەوە. پێغەمبەر(د.خ) مرد و ئەو لەدین هەڵگەڕایەوە. دوبارە ئەشعەس وتی: ئەگەر ئەم کارە بکەیت من وەك باشترینی پیاوی موسوڵمانی سەرزەمینەکەت دەبینی. ئەبوبەکر لەخوێنی خۆش بوو و کەسەکانی بۆ گەڕاندەوە. ئەو لەمەدینە مایەوە تا عێراق داگیر کرا و تالأنییەکانیان لەناو خەڵکەکەی دابەشکرد.

دەستەیەك دەڵێن: عێکرەمە دوای گرتنی عێراق گەشتە مەدینە. زیاد و موهاجیر بەو کەسانەی لەگەڵ ئەودا بوون، وتیان: براکانتان هاوکاریان بۆ ناردوون، ئەوان لەتالأنییەکان بکەنە شەریك. ئەو کارەیان کرد و لەتالأنییەکان پشکیان بۆ دانان.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب هاتە سەرکار وتی: شیاو نییە بۆ عەرەبەکان خاوەنی یەکتر بن چوونکە خوای گەورە فراوانی و بەربلأوی بەخشیوە وسەرزەمینی عەجەمەکانی کردۆتەوە. ئەو سەبارەت بەدانی بەهای ئازادی ئەسیرە عەرەبەکان لەرۆژگاری جاهلی و ئیسلام راوێژی کرد تا ئازاد بکرێن جگە لەو ژنانەی منالیان بۆ خاوەن و گەورەکانی خۆیان هێناوەتە دنیا. بەهای ئازادی هەرکەسی شەش یا حەوت وشتر دیاری کرد جگە لەکندە و حەنیفە کەبەهای ئازادی ئەوانی کەم

کردەوە چوونکە پیاوەکانیان کوژرابوون. دوای ئەمە لەهەموو شوێنەکاندا بەدوای ژنان گەڕان کەئەوانیان لەوێ ون کردبوو.

هەروەها لەم ساڵەدا مەعاز کوڕی جەبەل لەیەمەن گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبووبەکر فەرمانی دادوەری و دادپەروەری بەعومەر کوڕی خەتاب بەخشی. ئەو لەسەراسەری ڕۆژگاری خەلافەتی ئەبووبەکر لەناو خەڵکان دادوەری و داوەری کرد.

لەم ساڵەدا عەتاب کوڕی ئەسید یا عەبدولرەحمان کوڕی عەوف سەرپەرەستی کاروباری حەج کردنی گرتە ئەستۆ.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی چوارەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠٠٩

# پێڕست

## راپۆرتی کاری موسەنا کوڕی حارسە لەعێراق

راپۆرتی کاری موسەنا کوڕی حارسەی شیبانی بەمشێوە بو کاتێك خالید کوڕی وەلید ماڵئاوایی لێکرد و لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو شام بەرێکەوت، لەحیرە مایەوە و پاسەوانەکانی دانا و هەواڵنێرانی بۆ هەر لایەك نارد. کاری پارس کەمێك دوای ڕۆشتنی خالید لەحیرە لەساڵی سیانزەیەم /٦٣٤ زایینی بۆ شەهریران کوڕی ئەردەشێر کوڕی شەهریار شاپور ئاسان بویەوە. ئەو لەشکرێکی گەورەی بەفەرماندەیی هورموز جادویە کە لەدەهەزار پیاوی شەڕکەر پێك دەهات، رەوانەی شەڕی موسەنای کرد. موسنا لەحیرەوە بۆ روبەروبونەوەی ڕۆشت و فەرماندەی پێشەنگەکانی ئەو موعەنی و براکەی مەسعود بو. ئەو لەبابل مایەوە و هورموز بەرەو لای ئەو بەرێکەوت. خوسرەوی شەهریران بۆ موسنا نامەیەکی بەمشێوەی نوسی: من سوپایەکەم لە پەستەکان و ریسواکانی پارس بۆ روبەروبونەوەی تۆ ناردوە و ئەمانە بەخێوکەرانی مریشك و بەراز لەوەرێنەرەکانن. تەنیا بەهێزی ئەوان شەڕ لەگەڵ تۆ ئەکەم. موسەنا بۆی نوسی: تۆ یەکێکی لەم دوپیاوە بەمشێوەیە: یا گەردنکێش دەبیت و ئەمە لەبەرژەوەندی ئێمەیە و لەزیانی تۆ، یا درۆزن و ناشکرایشە درۆزنترین و ریسواترین کەسەکان لای خوا و خەڵك، پاشاکانن، بەلأم ئەوەی رێگەی راست نیشانی ئێمەدەدات ئەوەیە کەئێوە زیانتان لەوان داوە. ئێستا سوپاس بۆ خوایەك شیاوە کەزیانی ئێوەی لەسەر مریشك بەخێوکەران و بەراز لەوەرێنەکان دور خستەوە.

ئێرانیەکان لەنامەکەی موسەنا ترسان. هورموز و موسەنا لەبابل روبەروی یەك بونەوە و کوشتارێکی قورسیان دەستپێکرد. فیلی ئەوان بلأوەی بەموسوڵمانەکان دەکرد. لەبەر ئەمە موسەنا لەگەڵ دەستەیەك لەشەڕکەران خۆیان بۆ لەناو بردنی ئامادە کرد و فیلەکەیان کوشت. ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و هەلأتن و موسوڵمانان تا مەداین شوێنیان کەوتن و کوشتاریان کردن. کاتێك هورموز جادویە شکەستی خوارد، شەهریران مرد و خەڵکی ئێران گرفتاری ناسازگاری بون و سنورەکانی دیجلە لەدەست موسەنا مایەوە. دواتر ئێرانیەکان لەسەر پاشایەتی کچی ژنان کچی خوسرەو رێککەوتن. کاری

ئەم خاتونە بەختەوەری لێنەکەوتەوە چونکە ئەویان لەسەر کارەکەی لابرد و شاپور کوڕی شەهریرانیان کردە پاشا. کاتێك ئەویان کردە پاشا، فەروخزاد کوڕی بەندوان کاروبارەکانی رادەپەڕاند. ئەو داوای لەپاشا کرد ئازەرمیدۆخت کچی خوسرەو بکاتە هاوسەری ئەو. شاپور وەلامی دایەوە وبەپێشنیارەکەی رازی بو و ئازەرمیدۆخت توڕە. ئەو کەسی بۆ لای سیاوەخشی رازی نارد و گلەیی دەست پێکرد. سیاوەخش پەیامی بۆ نارد کە: مەڕۆ لای ئەو، بەڵکو داوای لێبکە ئەو بێتە لای تۆ. ژن پەیك و پەیامی بۆ فەروخزاد نارد و سیاوەخش دەست بەکار بو. کاتێك شەوی بوکێنی داهات، فەروخزاد ڕۆشتە لای کچەکە. سیاوەخش هێرشی کردە سەری و کوشتی. ئازەرمیدۆخت و سیاوەخش ئاهەنگی شاپوریان کرد و کوشتیان. دواتر ئازەرمیدۆخت هاتە سەر تەختی پاشایەتی ئێران و ئێرانیەکان گرفتاری کاروبارەکانی وڵاتداری بون.

لەم کاتەدا هەواڵ و پەیام لەئەبوبەکرەوە نەدەهات. موسەنا بەشیر کوڕی خەصاصیەی کردە جێگری خۆی لەسەر موسوڵمانەکان و بەرەو مەدینە بەرێکەوت تا راپۆرتی کاری بتپەرستەکان بەو بدات و داوای فەرمانێکی لێ بکات تا لەو کەسانی لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە و دواتر بەدڵێکی پاك باوەڕیان هێناوەتەوە، هاوکاری وەربگرێت چونکە ئەوان بۆ ئەو کارە چالاکتر و تێکۆشەرترن. موسەنا ڕۆشتە مەدینە و بینی ئەبوبەکر نەخۆشە و لەسەر هەڵدێری مەرگە. ئەبوبەکر عومەری بانگ کرد وپێی وت: وا هەست دەکەم ئەمڕۆ دەمرم. ئەگەر مردم، پێش ئەوەی دەست لەمن بدەیت خەڵك لەگەڵ موسەنا بۆ گۆڕەپانی شەڕ رەوانە بکە، نەکا هیچ گرفتاریەك ( وەك مەرگ) ئێوە لەسەر قاڵ بون بەکاروباری دین و ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواکەتان دوربخاتەوە. تۆ بینیت من بینەری مردنی پێغەمبەر(ص) بوم و بینیت چیم کرد لەگەڵ ئەوەی هیچ کات ئازارێك کوشەندەتر لەمردنی پێغەمبەر(ص) بەسەر مندا نەهاتوە. کاتێك خوا ئێوە بەسەر خەڵکانی شامدا سەرکەوتو بکات و ئەم سەرزەمینە لەسەر دەستی ئێوە بگرێت، عێراقیەکان بۆ عێراق بگەڕێنەرەوە چونکە ئەوان خەڵکانی ئەوێ و شارەزایانی کاروبارەکانی ئەوێ و زاڵبوان بەسەر دوژمنانی ئەوێن.

ئەبوبەکر شەوانە مرد و عومەر ئەوی بەخاك سپارد و خەڵکی بۆ هاورێیەتی کردنی موسەنا هاندا. عومەر وتی: ئەبوبەکر دەیزانی من حەز بەفەرماندەیی خالید کوڕی

وەلید ناکەم لەبەر ئەمە فەرمانی بەمندا هاورێکانی خالید بگەڕێنمەوە. لەبەر ئەوە بو هاورێ لەگەڵ ئەوان باسی خالیدی نەکرد.

کاری ئەبوبەکر تا سەردەمی ئازەرمیدۆخت گەیشت و لەوێ کۆتایی پێهات. بەمشێوە بو راپۆرتی کاروبارەکانی عێراق تا دوایین رۆژەکانی ژیانی ئەبوبەکر (خوا لێی رازی بێت).

## شەڕی ئەجنادین

ئەبو جەعفەری تەبەری ماوەیەك دوای شەڕی یەرموك ئاماژەی بەم شەڕە داوە و پشتی بەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق بەستوە. بەمشێوەیە کەفەرماندەکان کۆبونەوە و خالید کوڕی وەلید لەعێراقەوە بەرەو شام بەرێکەوت بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا. دەڵێت: خالید دوای مەرج راهیت بەرەو بەصرە ڕۆشت کەفەرماندەکان ئەبوعوبەیدەی جەراح و شورحبیل کوڕی حەسەنە و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان بون. خەڵکی ئەو ناوچەیە لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەستن و ئەمە یەکەم شاری شام بو لەرۆژگاری خەلافەتی ئەبوبەکر دەستی بەسەردا گیرا. دواتر هەمویان بۆ هاوکاری کردنی عەمرۆ کوڕی عاص کە لەعەرەبات بو، رەوانەی فەلەستین بون. رۆمیەکان لەئەجنادین کۆبونەوە و فەرماندەکەیان تەزاروق برای هراکلیوس بو. دەستەیەك دەڵێن: فەرماندەی رۆمیەکان کاپکلار بو. ئەجنادین لەنێوان بەیت جەبرین و رەملە لەسەرزەمینی فەلەستین جێگیرە. کاتێك عەمرۆ کوڕی عاص هەواڵی هاتنی موسوڵمانانی بیست، بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و پەیوەستیان بو. هەمویان لەئەجنادین باروبنەیان خست و ئوردویان لێدا. کاپکلار پیاوێکی عەرەبی بۆ لای موسوڵمانەکان رەوانە کرد تا راپۆرتی چۆنیەتی کاروبارەکانی ئەوانی بۆبێنێت. ئەو هاتە ناو موسوڵمانەکان و شەو ورۆژێك لەناو ئەواندا مایەوە و دواتر گەڕایەوە. کاپکلار وتی: چ هەواڵێکت هێناوە؟ وتی: شەوانە خۆپارێزانن و رۆژانە شەڕکەران. ئەگەر کوڕی پاشاکەیان دزی بکات، دەستی دەبڕن و ئەگەر زینا بکات، بەردبارانی دەکەن، چونکە دەیانەوێت راستی و دروستی لەناو خۆیاندا بکەنە فەرمانڕەوا. کاپکلار وتی: ئەگەر راستت بەمن وتبێت، لەژێر خاك بیبنینی ئەوان باشترە تا ئەوەی لەسەر خاك روبەرویان ببینەوە.

ئەوان رۆژی شەممە، دو شەوی کۆتایی لەجەمادی الاولی ساڵی سیانزەیەم / ٣٠ ژوئیەی

٦٣٤ زایینی روبەروی یەك بونەوە. موسوڵمانەكان سەركەوتن و بتپەرستەكان شكەستیان خوارد وكاپكلار و تەزاروق كوژران و دەستەیەك لەموسوڵمانەكانیش. لەناو ئەوان: سەلەمە كوڕی هشام كوڕی موغەیرە، هەبار كوڕی ئەسوەد، نوعەیم كوڕی عەبداللە نەحام، هشام كوڕی عاص كوڕی وایل و دەستەیەكیتر. دەستەیەك دەڵێن: هشام لەیەرموك كوژرا.

دەڵێت: دواتر هراكلیوس سوپاكەی خۆی بۆ شەڕی موسوڵمانان كۆكردەوە و هەردولای شەركەر لەیەرموك روبەروی یەك بونەوە. هەواڵی مردنی لەناكاوی ئەبوبەكر بەوان گەیشت كەسەرقاڵی شەركردن بون، هەروەها هەواڵی فەرماندەیی ئەبوعوبەیدە (عومەر ئەوی كردە فەرماندەی سوپای موسوڵمانان). ئەم شەڕە لەمانگی رەجەب/ سپتامبەری ٦٣٤ زایینی رویدا.

لەناو كوژراوەكان ئەم كەسانە دەبینران: زرار كوڕی خەتابی فێهری لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص)، عەمرۆ كوڕی سەعید كوڕی عاص لەكۆچكەران بۆ حەبەشە كەلەیەرموك كوژرا. فەزل كوڕی عەباس كەدەستەیەك دەڵێن لەمەرج الصفر كوژرا و دەستەیەك دەڵێن بەنەخۆشی تاعون كۆچی دوایی كرد، تولەیب كوڕی عومەیر كوڕی وەهبی قورەشی كەلەیەرموك كوژرا و لەشەڕكەرانی بەدر بو و لەیەكەم كۆچكەران بۆ مەدینە هەژمار دەكرا، عەبداللە كوڕی نەبی جەهمی قورەشی عەدەوی كەلەرۆژی گرتنی مەككە باوەڕی هێنا، عەبداللە كوڕی زوبەیر كوڕی عەبدولموتەلیب كەدوای كوشتنی دەستەیەك لەرۆمیەكان لەگۆڕەپانی شەڕ كوژرا و لەكاتی مردنی پێغەمبەر سی ساڵە بو و عەبداللە كوڕی توفەیل دەوسی ناسراو بە (زوالنور) (تێشك پرژێن) كەلەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) و لەباوەڕدارە سەرەتاییەكان ولەكۆچكەران بۆ حەبەشە بو.

دەستەیەك دەڵێن: شەڕی ئەجنادین لەساڵی پانزەیەم /٦٣٦ زایینی رویدا كە دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

## مردنی ئەبوبەكر

مردنی ئەبوبەكر شەوی سێ شەممە هەشت شەو بۆ كۆتایی جەمادی الثانی / ٢٢ ئوتی ٦٣٤ زایینی رویدا. ئەو لەم كاتەدا شەست و سێ ساڵی بو. گێڕانەوەی راست ئەمەیە.

دەستەیەك ئاماژەیان بەمێژووی دیکەیش داوە. جولەکەکان خواردنی ژەهراویان دەرخوارد دا. ئەو و حارس کوڕی کەلدە دەستیان بەخواردن کرد. حارس دەستی لەخواردن هەڵگرت وبە ئەبوبەکری وت: خواردنێکی ژەهراویمان خوارد کەلەیەك ساڵدا کۆتایی بەژیانمان دێنێت. ئەو دوانە دوای یەك ساڵ مردن. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەرۆژێکی ساردا سەرەو روخساری شۆرد وبۆ ماوەی ١٥ رۆژ گرفتاری لەرز و تا بو و نەیتوانی نوێژ لەگەڵ خەڵك بکات و فەرمانی بەعومەردا ئەو کارە ئەنجام بدات. کاتێك نەخۆش کەوت، خەڵك پێیان وت: ئایا پزیشك بانگ نەکەین؟ ئەبوبەکر وتی: پزیشك هاتە سەر سەرم و پێی وتم: ئەوەی شیاوی فەرمان بێت، فەرمانی پێدەدەم. ئەوان مەبەستەکەی ئەویان زانی وبێدەنگ بون. دواتر مرد.

رۆژگاری خەلافەتی ئەو دو ساڵ و سیانزە مانگ و دەشەو بو. دەستەیەك دەڵێن: دو ساڵ و چوار مانگ چوار شەو کەمتر بو. لەدایك بونی ئەو سێ ساڵ دوای ساڵی فیل بو.

ئەو پێشنیاری کرد ژنەکەی ئەسما کچی عومەیس و کوڕەکەی عەبدولرەحمان بیشۆن، فەرموی لەدوکفنیەوە بپێچن و کفنی سێیەم بکڕن وپێی زیاد بکەن. وتی: زیندو زیاتر لەمردو پێویستی بەجل و بەرگی تازە هەیە. هەروەها وتی ئەوە بۆ چڵك و کیمە.

شەوانە ئەویان بەخاك سپارد. عومەر لەمزگەوتی پێغەمبەر(ص) نوێژی لەسەر خوێند و چوار جار تەکبیری کرد. ئەویان لەناو هەمان تابوتدا برد کەپێغەمبەر(ص)یان برد. کوڕەکەی عەبدولرەحمان و عومەر و عوسمان و تەڵحە ڕۆشتنە ناو ئارامگاکەی. سەری ئەویان لای شانی پێغەمبەر(ص)ەوە جێگیر کرد و کێلی گۆڕەکەیان بەکێلی گۆڕەکەی پێغەمبەرەوە لکاند. گۆڕی ئەویان وەك گۆڕی پێغەمبەر(ص) یەکسان لەگەڵ زەوی دروست کرد. عایشە پرسەی بۆ دانا و ژنان هاوڕێیەتیان کرد. عومەر ئەوانی لەم کارە بەدور خستەوە (چونکە شین وڕۆڕۆ بۆ مردو لەهەر پلە و پایەیێك، بێت، لەئاینی ئیسلامدا حەرامە). ئەوان گوێیان لەقسەکانی ئەو نەگرت.. عومەر بەهشام کوڕی وەلیدی وت: کچی ئەبوقەحافە بێنەرە لای من. ئەو دایکی فەروە کچی ئەبوقەحافەی بردە لای عومەر. عومەر قامچی بەرز کردەوە چەند جارێك بەقامچی لێیدا. کاتێك ژنان گریانی ئەمەیان بیست، بڵاوەیان لێکرد.

دوایین وتە کەئەبوبەکر هێنایە سەرزمان، ئەوە بوکە: خوایە من وەك موسوڵمان بمرێنە

و پەیوەستی چاکەکارانم بکە (یوسف/١٢/١٠١).

تایبەتمەندیە جەستەییەکانی ئەبوبەکر بەمشێوە بو: پیاوێکی سپی پێست، چەماوە، ریشێکی تەنك، ناوچاوێك کە بەهۆی لاغری عارەقی لێدەباری، لوتێکی قنج، کونە لوتەکانی تەنگ و چاوەکانی قوولّ. بەخەنە قژی رەنگ دەکرد و کاتێك مرد باوکی زیندو بو.

ناو و نەژادی ئەو بەم شێوەیە: ئەبوبەکر عەبدالله (یا عەتیق) کوری ئەبی قەحافە عوسمان کوری عامر کوری عەمرۆ کوری کەعب کوری سەعد کوری تیم کوری مورە کوری لۆئەی کوری غالب کوری فیهر کوری مالك. رەچەڵەکی ئەو لەمورە کوری کەعب بەپێغەمبەر(ص) دەگات. دایکی ام الخیر سەلما کچی صەخر کوری عەمرۆ کوری کەعب کوری سەعد کوری تیم بو. دەستەیەك دەڵێن: پێغەمبەر(ص) پێی وت: تۆ لەئاگر بویت (عەتیقیت)لەبەر ئەمە ناوی عەتیقی بۆ خۆی هەڵگرت. دەستەیەکی دیکە دەڵێن بۆیە بەعەتیق ناویان برد چونکە جوان روخسار و چاك کردار بو. دایکی ماوەیەکی زۆر دوای ئەبوبەکر باوەری هێنا. ئەبوبەکر لەرۆژگاری جاهلی لەگەڵ قەتیلە کوری عەبەدوالعوزا کوری عامر کوری لۆئەی پەیوەندی هاوسەری بەست کەعەبدالله و ئەسما ی بۆ هێنایە دونیا. هەروەها لەرۆژگاری جاهلی رۆمان (دەعد) کەنانی کچی عامر کوری عومەیری کردە هاوسەری خۆی کەعەبدولرەحمان و عایشەی بۆ هێنایە دونیا. لەرۆژگاری ئیسلام ئەسما کچی عەمیسی کردە هاوسەر. ئەم ژنەپێشتر هاوسەری جەعفەری کوری ئەبی تالیب بو. ئەسما محەممەد کوری ئەبوبەکری پێ بەخشی. هەروەها لەرۆژگاری ئیسلامی لەگەڵ حەبیبەی ئەنساری کچی خارجە کوری زەید پەیوەندی هاوسەری بەست کەدوای مردنی ئەبوبەکر دایکی کولسومی بۆ هێنایە دونیا.

## ناوی داوەران و فەرمانرەواکان و دەبیرانی ئەبوبەکر

کاتێك ئەبوبەکر هاتە سەر کار، ئەبو عوبەیدە پێی وت: من کاروباری دارایی بۆ تۆ ئەنجام دەدەم و عومەر وتی: من کاری داوەری. عومەر یەك ساڵی بەسەر برد و دوکەس بۆ دادخوازی نەهاتنە لای. عەلی کوری ئەبی تالیب و عوسمان کوری عەففان و زەید کوری سابت کاری دەبیریان بۆ ئەنجام دەدا. هەر کەسێکی لابوایە، کاری دەبیری بۆ

دەگرد. فەرماندارەكانی ئەمانە بون: فەرمانداری مەككە، عەتاب كوڕی ئەسید كەلەهەمان رۆژی مردنی ئەبوبەكر یا چەند رۆژی دوای ئەو مرد، فەرمانداری تایف عوسمان كوڕی ئەبی عاص، فەرمانداری صەنعا موهاجیر كوڕی ئەبی ئومەیە، فەرمانداری حەزەر مەوت زیاد كوڕی لوبەیدی ئەنساری، فەرمانداری خەوەلان یەعلی كوڕی مونییە، فەرمانداری زەبید و رەمەع ئەبوموسا ئەشعەری، فەرمانداری جەنەد مەعاز كوڕی جەبەل و فەرمانداری بەحرەین عەلا كوڕی حەزرەمی. ئەو جەریر كوڕی عەبداللەی بۆ نەجران رەوانە كرد، عەبدالله كوڕی سووراى بۆ جورەش و عەیاز كوڕی غەنەمی بۆ دومە ئەلجەندەل. ئەبوعوبەیدە و شورەحبیل و یەزید كوڕی عەمرۆ لە شام بون. هەركام لەم پیاوە شەڕكەرانە فەرماندەی یەكێك لەسوپاكان بو و فەرماندەی هەمویان خالید كوڕی وەلید. نیگاری ئەنگوستیلەكەی بەم شێوە بو (نعم القادر الله) خوا باشترین بەتوانایە ). باوكی دوای ئەو شەش مانگ و چەند رۆژێك ژیا و لەنەوەد و حەوت سالێدا مرد.

## گێڕانەوەی هەندێك لەكارەكانی ئەو و كارە چاكەكانی ئەو

ئەبوبەكر یەكەم كەس بو باوەڕی بەئیسلام هێنا و ئەم وتەی هەندێك لە مێژوو نوسانە. وتارە جیاوازەكان لەمبارەوە پێشتر ئاماژەیان پێدرا. پێغەمبەر(ص) وتی: پێشنیار ئیسلامم بەكەس نەكرد مەگەر ئەوەی دەرنگی كرد وبیری لێكردەوە جگە لەئەبوبەكر كەبێدرنگ باوەڕی بەمن هێنا. ئەوەی لەپێغەمبەر(ص) سەبارەت بەرێزداری ئەبوبەكر بۆمان ماوەتەوە، فراوانە وەك ئەوەی مژدەی بەهەشتی پێبەخشی، وتویەتی تۆ لەئاگر بێ بەریت و پێشگوییەكانی دیكە سەبارەت بەرێزداری ئەو و بونی بەخەلیفە لەداهاتودا بەهەمان شێوە كەبەو ژنەی وت: ئەگەر منت نەبینی، وەرە لای ئەبوبەكر، هەروەها وتی: لەجێگرەكانم لەدوای من یانی لەئەبوبەكر و عومەر فەرمان ببەن. هاوشێوەی ئەم وتارانە فراوانە.

ئەو لەشەڕی بەدر و ئوحود و خەندەق لەگەڵ پێغەمبەر(ص)دابو. حەوت كەسی ئازاد كرد كە هەمویان لەرێگەی خوادا ئەشكەنجە دەكران لەناو ئەوان: بەلال، عامر كوڕی فوهەیرە، زێنیرە، نەهدیە، كەنیزی بەنی مۆئمێل، دایكی عوبەیس و ئەسلەم، ئەو حەفتا

هەزار درەم؟ دینار؟ی بو کەهەموی لەگەڵ ئەوەی لەبازرگانیەوە بەدەستی هێنا، لەرێگەی خوادا خەرج کرد.

کاتێك بەخەلافەت گەیشت و عەرەبەکان لەئیسلام هەڵگەڕانەوە، بەشمشێرێکی دەرکێشراو لەکاڵان رۆیشتە زی قوصەی. عەلی هات و هەوساری ماینەکەی گرت و پێی وت: بۆ کوێ دەڕۆیت ئەی جێگری پێغەمبەر(ص)ی خوا؟ هەمان قسەت پێ دەڵێم کە پێغەمبەر(ص) لەرۆژی شەڕی ئوحود بەتۆی وت: شمشێرەکەی خۆت بکەرە کاڵان و ئێمە گرفتار و پرسەگێری خۆت مەکە، کەسوێند بەخوا ئەگەر تۆ لەدەست بدەین، ئیسلام سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. ئەبوبەکر گەڕایەوە و سوپای ئیسلامی رەوانە کرد.

ئەو لە (سۆنح) گەنجینەیەکی بو کەلەوێ ژیانی بەسەر دەبرد. دواتر لەوێ هاتە مەدینە. پێیان وت: ئایا کەس دانەنێین تا پاسەوانی ئەو شوێنە بکات؟ وتی: نە. ئەو هەمو سامانەکەی ئەوێی بۆ موسوڵمانەکان خەرج کرد و هیچی تیا بەجێ نەهێشت. کاتێك هاتە مەدینە گەنجینەکەی لەماڵەکەی خۆیدا جێگیر کرد.

لەخەلافەتی ئەو کانی بەنی سولیەم فراوان بو. ئەو لەبەش کردن بەهەموان بەیەك ئەندازەی دەبەخشی: یەکەم باوەڕهێنەران، ئەوانەی درەنگتر باوەڕیان هێنا، ئازاد، کۆیلە، نێر و مێ. پێیان وت: دەبێت باوەڕدارەکان کۆنەکان زیاتریان بەرکەوێت. وتی: هەموان بۆ خوا باوەڕیان هێناوە و حەقی ئەوان لەسەر خوا پێویست کرا کەرۆژی کۆتایی بێ کەم وکوڕی بەوانی دەبەخشێت. لەم جیهانە ئەم ئەندازەیە بەسیانە. ئەو زستانان جل و بەرگی دەکڕی و لەناو هەژارەکان دابەشی دەکرد. کاتێك ئەبوبەکر مرد، عومەر بڕواپێکراوانی کۆکردەوە و گەنجینەکەی کردەوە، کەجگە لەیەك دینار هیچیان تیا نەدۆزیەوە. ئەوان خۆشەویستیان بۆ ئەو زیادی کرد و هەموان لەخوا پاڕانەوە لەو خۆش بێت.

ئەبو صالحی غەفاری دەڵێت: عومەر سەرپەرەستی ژنێکی کوێری لەئەستۆدابو کە لەمەدینە دەژیا و ئەو شەوانە دەڕۆشتە لای ئەو ژنە کوێرە. هەرجار کەدەڕۆشتە لای ئەو ژنە دەیبینی پێش ئەو کەسێکی دیکە هاتوە و کارەکانی ئەو ژنەی ئەنجام داوە. عومەر لەسەر رێگای ئەو پیاوە نەناسراوە دانیشت و بینی ئەبوبەکرە کە لەهەمان کاتی

خەلافەت، بەنهێنی دەڕواتە لای ئەو ژنە و کارەکانی ئەنجام دەدات. عومەر وتی: سوێند بەگیانی خۆم، خۆتیت! ئەبوبەکر کوڕی حەفص کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێك مردن بەسەر ئەبوبەکر زاڵبو، عایشە هاتە لای و ئەم قسەی لەکەسێکی دیکە گێڕایەوە:

لعمرك ما یغنی الثراء عن الفتی          اذا حشرجت یوما و ضاق بها الصدر

یانی: سوێند بەخوا سامانی ئەم جیهانە ناتوانێت زیان لەخەڵك دور بخاتەوە بەتایبەت ئەو کاتەی هەناسە لەقوڕگدا گیر بکات وسینە تەنگ ببێت و مەرگ لەبەردەرگا دەرکەوێت.

ئەبوبەکر بەتوڕەییەوە سەیری کرد و وتی: بەمشێوە نیە کە ئەم کەسە دەڵێت بەڵکو بەو شێوەیە کەخوا دەفەرمێت: مەستی و بێهۆشی مەرگ گەیشت. ئەمە ئەو شتەیە لێی هەڵدەهاتی (ق/٥٠/١٩). من فلاّن بێستانم بەتۆ بەخشیوە بەلاّم لەدڵما شتێکی تیا بو، بیگەڕێنەرەوە، عایشە گەڕاندیەوە. ئەبوبەکر وتی: ئەم دوانە دوخوشك و براکەی تۆن. عایشە وتی: ژنی دوەم کێیە؟ ئەبوبەکر وتی: ئەو ئەسما  هاوسەرەکەی منە. دوبارە وتی: ئەوەی سکی گەورە بوە کچی خارجە (یانی هاوسەرەکەی ئەو)یە. ئەو سکی پڕ بو و دوای مەرگی ئەبوبەکر دایکی کولسومی هێنایە دونیا. هەروەها پێی وت: لەو کاتەوەی ئێمە جڵەوی کاروباری موسوڵمانانمان گرتۆتە دەست، دینار و درەمێکمان لەوان نەخواردوە، لەخۆراکی ئەوانمان خوارد و جل و بەرگی ئەوانمان لەبەر کرد. لای ئێمە لەسامانی موسوڵمانەکان جگە لەم وشترە و ئەم راخەرە و ئەم کۆیلەیە شتێکی دیکە نیە. کاتێك مردم، هەمویان بۆ لای عومەر بنێرە. کاتێك مرد، ئەوانم بۆ لای عومەر نارد. کاتێك بینی، ئەوەندە گریا کەفرمێسکی زەوی تەڕ کرد. بەردەوام دەیوت: خوا لەئەبوبەکر خۆش بێت! فەرمانڕەواکانی دوای خۆی خستە گێژاوەوە. ئەم قسەی بەردەوام دوبارە دەکردەوە. دواتر فەرمووی بیانبەن بۆ گەنجینە. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی: پەنا بەخوا، لەبنەماڵەی ئەبوبەکر کۆیلەیەك و وشترێك و راخەرێك وەردەگریت کەبەهاکەی پێنج درەمە! چی دەبێت ئەگەر فەرمان بدەیت ئەم شتانە بۆ ئەوان بگەڕێننەوە. عومەر وتی: نا، سوێند بەو کەسەی محەممەدی نارد ئەو کارە ناکەم و لەرۆژگاری فەرمانڕەوایی من ئەم کارانە ناکرێت. ئەبوبەکر خۆی لەوە رزگار نەکردوە کەمن خۆمی تیا گرفتار بکەم. ئەبوبەکر فەرمووی هەمو ئەو شتانەی بۆ خەرجی و

کەڵك وەرگرتنی خۆی هەڵیگرتوە، دوای مردنەکەی بۆ گەنجینەی بگەڕێننەوە.

دەڵێن: ژنەکەی تاسەی شیرینی کرد. ئەبوبەکر وتی: زێرمان نیە شیرینی بکڕین. ژن وتی: لەخەرجی رۆژانە هەر رۆژەو کەمێك پاشەکەوت دەکەم تا شیرینی بکڕم. ئەبوبەکر وتی: ئەو کارە بکە. ژن لەماوەی چەندین رۆژ شتێکی کۆکردەوە. کاتێك زێرەکەی نیشاندا تا شیرینی بکڕێت، ئەبوبەکر هەڵیگرت و گەڕاندیەوە بۆ گەنجینە و وتی: ئەم ئەندازەیە لەخۆراك بۆ ئێمە بەسە. ئەو فەرمانیدا بەهەمان ئەندازە کەرۆژانە پاشکەوتی دەکرد لەخەرجیەکەی ئەو کەم بکەنەوە. لەسامانەکەی خۆی قەرەبوی رۆژگاری پێشوتری کردەوە.

سوێند بەخوا ئەمە هەمان خۆپارێزی بێ وێنەیە کەزیاد ناکات. لەروی راستی و دروستی بو خەڵك ئەویان کردە رێبەری خۆیان و خستیانە پێش. خواوەند لەو رازی بێت و ئەو رازی بکات.

ماڵی ئەبوبەکر لەسونح لای هاوسەرەکەی حەبیبە کچی خارجە بو. دوای ئەوەی بەیعەتیان لەگەڵ کرد، چوار مانگ لەوێ مایەوە. بەرەبەیانان پیادە یا سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی بۆ مەدینە هات و لەگەڵ خەڵك نوێژی دەخوێند و کاتێك شەو دادەهات بۆ سونح دەگەڕایەوە. بەیانی دەرۆشتە بازار و کاری کڕین و فرۆشی نیازەکانی خۆی دەکرد. ئەو چەند سەر مەڕی بو کەشەوانە سەردانی دەکردن. هەندێ کات خۆی ئەوانی دەبردە دەر و دەیلەوەڕاندن و هەندێکات کەسانی دیکە دەیانبرد. ئەو مەڕی بۆ خەڵك دەدۆشی وپارەی وەردەگرت. کاتێك بۆ خەلافەت بەیعەتیان پێدا، کچێك وتی: ئیتر دراوسێ دیوار بەدیوارەکەمان شیرمان بۆ نادۆشێت. ئەبوبەکر قسەکەی بیست وتی: بەڵێ، سوێند بەگیانی خۆم بێ گومان شیرتان بۆ دەدۆشم. هیوادرام، ئەوەی بەمنیان بەخشیوە، گۆڕانکاری لەمندا دروست نەکات. ئەو مەڕی بۆ ئەوان دەدۆشی. شەش مانگ دوای هاتنە سەر کار، هاتە مەدینە و وتی: ئەنجامدانی کاری خەڵك و کاری خۆ پێکەوە ئەگەری ئەنجامدانیان نیە. دەبێت کاتی بۆ دابنرێت و سەرقاڵی کاروبارەکانی ئەوان بین و بەردەوام ئاگادار و چاودێری کارەکانی ئەوان بین. ئەو وازی لەبازرگانی کردن هێنا و لەسامانی خەڵك بەشێوەیەکی رۆژانە بۆ خۆی خەرجی هەڵدەگرت و ژیانی خۆی و ژن و منداڵەکەی پێ بەسەر دەبرد. حەجی دەکرد و دەرۆشتە عەمرە. ئەوەی بۆ ئەویان دیاری

کرد، شەش هەزار درەم لەساڵێکدا بو. دەستەیەك دەڵێن: ئەوەندەیان بۆ دیاری کرد کەبەسی بێت. کاتێك مەرگی نزیك بویەوە، پێشنیاری کرد زەویەکەی بفرۆشن و ئەوەی لەموسوڵمانانی وەرگرتوە، بیدەنەوە.

ئەو یەکەم فەرمانڕەوا بو خەڵکەکەی خەرجی و داهاتی ژیانیان بۆ بڕیەوە، یەکەم خەلیفە بو هاتە سەرتەخت و باوکی زیندو بو. یەکەم کەس بو قورئانی بە(مصحف) خوێند و یەکەم کەس بو بەخەلیفە ناوبرا.

## دیاری کردنی عومەر لەلایەن ئەبوبەکرەوە

کاتێك مەرگی ئەبوبەکر نزیك بویەوە، عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بانگ کرد و وتی: من لەچۆنیەتی کاروبارەکانی عومەر ئاگادار بکەرەوە. عەبدولرەحمان وتی: لەوەی گومان دەکەیت باشترە جگە لەوەی توڕەییەکەی تیا دەبینرێت. ئەبوبەکر وتی: لەبەر ئەوەیە من بەنەرم دەزانێت و ئەگەر جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست، ئەندازەیەکی بەرچاو لەتوڕەیی پشت گوێ دەخات و نایهێڵێت. من چەندین جار بەوردی لێم روانیوە و بینیم هەرکاتێك لەکەسێك توڕە دەبم، ناچارم دەکات ببەخشم، ئەگەر بۆ کەسێك زیاد لەرادە نەرمیم لەخۆم نیشان بدایە، ناچاری دەکردم، کارەکانی لێ دژوار بکەم. ئەو عوسمان کوڕی عەفانی بانگ کرد و وتی: من لەچۆنیەتی کاروبارەکانی عومەر ئاگادار بکەرەوە. عوسمان وتی: ناخی باشتر لەروخساریەتی و لەناو ئێمەدا کەس لەو باشتر نیە. ئەبوبەکر بەم دوانەی وت: لەوەی لای ئێوە باسی دەکەم کەس ئاگادار نەبێتەوە. ئەگەر عومەرم پشت گوێ دەخست چاوم لەعوسمان نەدەپۆشی. باشتر بۆ عوسمان ئەوەیە جڵەوی کاروبارەکانی ئێوەی لەدەستا نەبێت. منیش حەزم دەکرد جڵەوی کاروبارەکانی ئێوە لەدەستی مندا نەبوایە.

لەم ناوەدا تەڵحە کوڕی عوبەیدالله هاتە لای ئەبوبەکر وپێی وت: عومەر کوڕی خەتابت کردە جێگری خۆت لەسەر خەڵك لەگەڵ ئەوەی دەتزانی، بەبونی تۆ، خەڵك لەدەستی ئەو چی دەکێشن. بارودۆخ چۆن دەبێت کاتێك ئەو بەسەر خەڵکەوە بێت و کەس لەسەر ئەو نەبێت؟ تۆ دەڕۆیتە سەردانی خواکەت و ئەو لێت دەپرسێت چیت لەگەڵ خەڵکەکەی خۆت کرد. ئەبوبەکر وتی: دامنیشێنن. ئەویان دانیشاند. وتی: ئایا من

لەخوا دەترسێنیت؟ کاتێك ببینم و لێم بپرسێت چیم کرد، دەڵێم باشترین کەسم کردە فەرمانڕەوای خەڵکەکەم.

دواتر ئەبوبەکر، عوسمان کوڕی عەففانی بانگ کرد و بەتەنیا لەگەڵ ئەو کۆبویەوە تا فەرمانی جێگری عومەر بنوسێت. پێی وت: بنوسە: بەناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەمە فەرمانێکە لەئەبوبەکر کوڕی ئەبی قەحافە بۆ موسوڵمانان، بەلآم دواتر. ئەوسا لەهۆش چو. عوسمان درێژەی فەرمانەکەی بەمشێوەیە نوسی: بەلآم دواتر، من عومەر کوڕی خەتاب وەك جێگری خۆم بۆ فەرمانڕەوایی ئێوە دەست نیشان دەکەم و هیچ باشیەکەم لەئێوە نەشاردەوە. دواتر ئەبوبەکر هاتە هۆش و وتی: فەرمانەکەم بۆ بخوێنەرەوە. عوسمان ئەوەی خوێندبوی بۆ ئەبوبەکری خوێندەوە. ئەبوبەکر وتی: خواگەورەیە. واهەست دەکەم ترسایت ئەگەر من بمرم و فەرمانەکە تەواو نەکەم، خەڵك گرفتاری ناسازگاری دەبن و لەبێهۆشی من زیانیان بەردەکەوێت. عوسمان وتی: بەڵێ. ئەبوبەکر وتی: خوا لەئیسلام و ئیسلامیەکان باشترین پاداشتت پێ بدات.

کاتێك فەرمانەکەی نوسی، فەرموی بۆ خەڵکیان خوێندەوە. ئەو خەڵکی کۆکردەوە و فەرمانەکەی بەکۆیلەکەی خۆی و هاورێ لەگەڵ عومەر بۆ لای ئەوان نارد. عومەر بەردەوام دەیوت: بێدەنگ بن و گوێ رادێرن کەفەرمانی جێگری پێغەمبەر(ص) بۆ ئێوە دەخوێندرێتەوە چونکە ئەو هیچ باشیەکی لەئێوە درێغ نەکرد. خەڵك ئارامیان گرت. کاتێك فەرمانەکەیان بۆ خوێندرایەوە، بیستیان و فەرمانیان برد. ئەبوبەکر لەبەرابەر خەڵك هاتە بەرزاییەك و وتی: من یەکێك لەخزمەکانی خۆم نەکردە جێگری خۆم، بەڵکو عومەر کوڕی خەتابم وەك جێگر دەستنیشان کرد، گوێرایەڵی قسەکانی بکەن و فەرمانی لێ ببەن چونکە من باشترین کار و ئەندێشەکانم بۆ ئێوە ئەنجام داوە. وتیان: بیستمان و فەرمان دەبەین. دواتر عومەر کوڕی خەتابی بانگ کرد وپێی وت: من تۆم بەسەر هاوەڵآنی پێغەمبەر(ص) دانا. پێشنیاری خۆپارێزی پێکرد و دواتر وتی:

ئەی عومەر، خوا حەقێکی شەوانەی هەیە کە لەرۆژی رۆشن پێی رازی نابێت و حەقێکی رۆژانەی هەیە لەو شەودا پێی رازی نابێت. ئەو بەنوێژی سونەت رازی نابێت مەگەر ئەوەی فەرزەکانت ئەنجام دابێت. ئەی عومەر، ئایا نازانی لەرۆژ هەستانەوە تای تەرازوی ئەو کەسانە قورس دەبێت کەشوێن راستی و دروستی کەوتون و جگە لەراستی

و دروستی شتەکانی دیکە بەهیچ لەقەڵەم دەدەن. تەرازوێك کەتەنیا لەسەر راستی و دروستی دەسوڕێت و هیچ شتێکی دیکەی تیا دانانرێت، شیاوە قورس و گرانسەنگ بێت. ئەی عومەر، ئایا نەتبینی قورسایی تای تەرازوی ئەو کەسانەی لەرۆژی هەستانەوە سوك بو کەشوێن ناراستی و خواری کەوتن و بەسوکیان زانی؟ ئەو تەرازووەی تەنیا ناڕاستی تیا دادەنرێت شیاوە سوك بێت. ئەی عومەر ئایا نەتبینیوە ئایا هیوا لەگەڵ ئایەی ترس و ئایەی ترس لەگەڵ ئایەی هیوا هاتەخوار تا خواپەرستان ترسان و هیوادار بن. خواپەرەست دەبێت هیچ کات شتێکی لەخوا نەوێت کەشیاو نیە بۆی و لەهیچ نەترسێت ونەوسا بەدەستی خۆی، خۆی بخاتە ناوی. ئەی عومەر، ئایا نەتبینیوە خواوەند بە کار ڤێزەونەکانیان ئاماژەی بەدۆزەخیەکان داوە. کاتێك بیری ئەوان دەکەمەوە، دەڵێم: هیوادارم لەوان نەبم. خوا بەباشترین کارەکانیان باسی بەهەشتیەکان دەکات چونکە ئەو لەکارە ناشیرین و گوناهە وردەکانی ئەوان خۆش دەبێت. کاتێك بیری ئەوان دەکەم، دەڵێم: کارەکانی من لەکوێ و کارەکانی ئەوان لەکوێ؟ ئەگەر بەجوانی گوێ لەپێشنیارەکانی من بگریت، دەبێت هیچ غایبێك لەئامادەبوێك کەمەرگە، لای تۆ خۆشەویست تر نەبێت. من ناتوانم کارێکی سەرسوڕهێنەر بکەم.

ئەبوبەکر مرد، کاتێك بەخاك سپێردرا، عومەر ڕۆشتە سەرتەختی وتاردان و قسەی بۆ خەڵك کرد و وتی: عەرەبەکان هاوشێوەی وشترێکی سەرکێشن کە بەناچار بەدوای لێخوڕەکەی خۆیان دەڕۆن. دەبێت بزانێت لێخوڕەکەی بۆ کوێی دەبات. بەڵام من، سوێند بەخواوەندی کەعبە بێ گومان ئێوە بۆ ڕێگەی راست دەبم، یەکەم نامەی بۆ ئەبوعوبەیدەی جەراح نوسی و فەرمانی پێدا فەرماندەیی سوپاکەی خالید کوڕی وەلید بگرێتە دەست و خالید لەسەر کار لاببات. لەبەر ئەوە ئەم کارەی کرد چونکە لەکاتی رودانی چارەنوسی مالك کوڕی نەویرە (خالید ئەوی کوشت و هەمان شەو لەگەڵ ژنەکەی خەوت)، لەخالید تورە بو و لەکارەکانی ئەو لەشەڕەکاندا ناڕازی. یەکەم قسەی، لەسەر کار لابردنی خالید بو. وتی: هیچ کات لەلایەن منەوە بۆ کارێك راناسپێردرێت. بۆ ئەبوعوبەیدەی نوسی: ئەگەر خالید خۆی بەدرۆزن و ناراست کار لەقەڵەم بدات. بافەرماندەی سوپاکەی بێت و ئەگەر خۆی بەدرۆزن نەزانێت، تۆ فەرماندەیی سوپاکەی ئەو بگرە ئەستۆ و دەستار لەسەری هەڵگرە و سامانەکەی بکە بەدوبەش (نیوەی هەڵگرە

و نیوەی بەخۆی بسپێرە). ئەم فەرمانەیان بەخالیددا. ئەو لەمبارەوە لەگەڵ خوشکەکەی راوێژی کرد. ئەو ژنی حارس کوڕی هشام بو. فاتیمە پێی وت: سوێند بەخوا عومەر تۆی خۆش ناوێت. حەز دەکات تۆ خۆت بەدرۆزن و ناڕاست کردار لەقەڵەم بدەیت و تۆ لەسەر کارەکەت لاببات. خالید سەری خوشکەکەی خۆی ماچ کرد و وتی: راستت وت. ئەو خۆی بەدرۆزن لەقەڵەم نەدا. ئەبوعوبەیدە فەرمانیدا، دەستارەکەیان لەسەر کردەوە و سامانەکەیان کردە دوبەش. دواتر خالید گەڕایەوە مەدینە بۆ لای عومەر. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو، بەڵكو لەشام مایەوە. ئەم گێڕانەوەیە راسترە.

## گرتنی دەمەشق

دەڵێن: کاتێك خوا خەڵکی یەرموکی تێکشکاند، ئەبوعوبەیدە بەشیر کوڕی کەعبی حومەیری لەیەرموك کردە فەرمانڕەوا. ئەو بەرێکەوت تا گەیشتە صۆفر. هەواڵی پێگەیشت کەتێکشکاوان لە فێحل کۆبونەوە. هەروەها هەواڵی پێگەیشت بۆ خەڵکی دەمەشق لەحمصەوە هاوکاریەکی بەرچاو نێردراوە. سەبارەت بەم هەواڵانە نامەی بۆ عومەر نوسی. عومەر نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا لەدەمەشقەوە دەست پێبکات چونکە ئەم شارە قەڵای شام و پایەتەختی خەڵکەکەیەتی. سوپایەك بۆ شەڕی خەڵکی فێحل بنێرێت و سەرقاڵیان بکات. کاتێك دەستی بەسەر دەمەشقدا گرت، بەرەو فێحل بڕوات و دەست بەسەر ئەم شارەیشدا بگرێت. ئەو و خالید بڕۆنە حمص و عەمرۆ شورەحبیل کوڕی حەسەنە لەفەلەستین و ئەردەن بەجێبێڵن.

ئەبو عوبەیدە دەستەیەك لەموسوڵمانەکانی بۆ فێحل نارد کە لەنزیك ئەو شوێنە دابەزین. رۆمیەکان ئاویان لەدەوروبەری فێحل بلاّو کردەوە و زەمین بو بەقوڕاو و لیتاو و موسوڵمانەکان لەوێ ئوردویان لێدا. یەکەم خەڵکان کە لەشام گەمارۆدران، خەڵکانی فێحل و دواتر خەڵکانی دەمەشق بون. ئەبوعوبەیدە سوپایەکی بەرێکرد کە لەنێوان حمص و دەمەشق جێگیر بون. سوپایەکی دیکەی رەوانە کرد و لەنێوان فەلەستین و دەمەشق خێوەتیان هەڵدا. ئەبوعوبەیدە لەگەڵ خالید بەرێکەوتن و لەدەمەشق دابەزین کەنەستاس فەرمانڕەوایەتی دەکرد. ئەبوعوبەیدە لەلایەك دابەزی و خالید و عەمرۆ

هەرکام لەلایەك. هراكليوس لەنزیك حمص بو. موسوڵمانان بۆ ماوەی حەفتا شەو ئەوانیان گەمارۆدا و بەهێرش و شاڵاوی بەردەوام شەڕی ئەوانیان کرد. سوپاکەی هراكليوس هاوکاری دەمەشقیان کرد و سوارەکانی موسوڵمان کە لەنزیك حمص بون، ڕێگەی ئەم کارەیان لێگرتن.

بۆ بەتریق (پاتریارك) یافەرمانڕەوای خەڵکانی ئەوێ، منالێك هاتەدنیا. ئەو سفرەیەکی بلاو کردەوە و خەڵکی بۆ خواردن بانگێشت کرد. ئەوان سەرقاڵی خواردن و خواردنەوە بون و جێگە و پێگەی خۆیان لەبیر کرد. موسوڵمانان لەم روداوە هیچیان نەدەزانی جگە لەخالید کەنەدەخەوت و کارەکانی ئەوان لای ئەم ئاشکرا بو. ئەو لەتەنافەکان، پەیژە و کەمەندەکانی دروست کرد. کاتێك ئەو رۆژە گەیشتە شام، ئەو و سوپاکەی هاوڕێی لەشوێنەکەیان هەستان و قەعقاع کوڕی عەمرۆ و مەزعور کوڕی عودەی وکەسانی هاوشێوەی ئەوان لەپێشیانەوە بەرێکەوتن و وتیان: کاتێك دەنگی بانگتان لەسەر دیوارەکە بیست، بەرەو لای ئێمە وەرن و ئاهەنگی دەروازەکە بکەن. کاتێك ئەو و هاوڕێکانی گەشتنە سەر دیوارەکان، تەنافەکانیان شۆڕ کردەوە. دو تەناف بەشۆڕکراوی مانەوە. قەعقاع و مەزعور بەو دو تەنافەدا سەرکەوتن و تەنافەکانیان بەهەیوانەکەوە بەستەوە. ئەوێ بەهێزترین وپڕ ئاوترین شوێنی دەمەشق بو. موسوڵمانان سەرکەوتن. دواتر خالید و هاورێکانی دابەزین و چەندین کەسیان بۆ پاسەوانی کردن لەوێ دانا و فەرمانیان پێدان بانگ بدەن. ئەوان بانگیان وت: موسوڵمانەکان بەرەو تەنافەکان و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتن. خالید گەیشتە ئەو کەسانەی لەبەرابەریدا بون و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و درگاوانەکانی کوشت. خەڵکی شار تۆقان و نەیانزانی چیان بەسەر هاتوە. خەڵکی هەر سوچێك بەنزیکترین کەسانەوە سەرقاڵ بون، خالید دەروازەکەی کردەوە و خەڵکانی و شەڕکەرانی ئەو ناوچەی کوشتار کرد.

کاتێك رۆمیەکان ئەمەیان بینی، ئاهەنگی نەبوعوبەیدەیان کرد و پێشنیاری ئاشتیان پێدا. ئەو بەپێشنیارەکەی ئەوان رازی بو و ئەوان دەرگاکەیان بۆ کردەوە و پێیان وت: وەرە ناو و ئێمە لەبەرابەر خەڵکەکەی خۆت بپارێزە. جێگیرکراوانی هەر دەروازەیەك بەئاشتی بۆ خەڵکەکەی خۆیان رۆشتنە ناو و خالید بەزۆری شمشێر. خالید و فەرماندەکانی دیکە لەدەمەشق چاویان بەیەك کەوت. ئەم بەکوشتار و تالانی و ئەوان

بەئاشتی و ئارامی. ئاشتی ئەوان لەسەر بنەمای دابەش کردن بەشێوەی نیو بەنیو بو. هاورێ لەگەڵ ئەوان، بەشێکیان بۆ ئەو سوپایە هەڵگرت کە لەنزیك فێحل و حمص بون. هەروەها ئەو کەسانەیشیان کردە شەریك کەپشتیوانی موسوڵمانەکان بون.
ئەبوعوبەیدەی هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بۆ عومەر نوسی. نامەی عومەر گەیشت کەفەرمانی بەئەبوعوبەیدە دەدا سوپاییەکانی عێراق بۆ عێراق بۆ لای سەعد کوڕی وەقاص رەوانە بکات. ئەوانی رەوانە کرد و هاشم کوڕی عوتەبەی مێرقالی وەك فەرماندەی ئەوان دیاری کرد. لەم سوپایە چەندین کەس کوژرابون. ئەبو عوبەیدە چەندین کەسی لەجێی کوژراوەکان دانا. لەناو ئەوکەسانەی رەوانەی کرد، ئەشتەر و کەسانی دیکە بون. ئەبوعوبەیدە خۆی بەرەو فێحل بەرێکەوت.

## شەڕی فێحل

کاتێك دەمەشق دەستی بەسەردا گیرا، ئەبوعوبەیدە بەرەو فێحا بەرێکەوت و یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی لەسەر دەمەشق دانا و خالیدی لەگەڵ پێشەنگەکان رەوانە کرد. شورەحبیل کوڕی حەسەنە فەرماندەی خەڵکەکە بو، عەمرۆ کوڕی عاص و ئەبوعوبەیدە فەرماندەی دوباڵی چەپ و راست بون. زورار کوڕی ئەزوەر فەرماندەی سوارەکان و عەیاز کوڕی غەنەم فەرماندەی پیادەکان. خەڵکی فێحل ئاهەنگی بەیسانیان کردبو و ئەو ئاهەنگی ئەم شارەی کرد. شورحبیل خەڵکی لەفێحل دابەزاند. لەنێوان ئەوان و رۆمیەکان، زۆلکاوەکان جێگیر بو. نامەیان بۆ عومەر نوسی. عەرەبەکان ئەو شەرکەرانەیان بە بەیسان و فێحل و زات ئەلرەدغە ناوبرد. خەڵك لەوێ مانەوە و چاوەڕوانی گەیشتنی نامەکەی عومەریان دەکرد. رۆمیەکان ئەوانیان فریودا. ئەوان بەسەرکردەیی سەقلار کوڕی کیخراق هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان. موسوڵمانەکان بۆ شەڕ کردن ئامادە بون. کاتێك هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان نەیانتوانی شەڕیان لەگەڵ بکەن. شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد کەئەو شەوە تا بەرەبەیان و لەبەرەبەیانەوە تاشەو درێژەی کێشا و لەبەرژەوەندی موسوڵمانەکان بو. شەو خێوەتێکی رەشی بەسەر ئەواندا کێشا و ئەوانی سەرگەردان کرد. رۆمیەکان پەرێشان هەڵاتن و سەرکردەی ئەوان سەقلار کوژرابو و ئەو کەسەی دوای ئەو فەرمانەدیی ئەوانی دەکرد،

نەستورس بو. موسوڵمانان بەسەر ئەواندا زاڵبون و رۆمیەکان چارەی کارەکەی خۆیان نەدەزانی. شکەست، ئەوانی بۆ زۆلکاوەکان پاشەکشێ پێ کرد وئەوان ڕۆشتنە ناو زۆلکاوەکان. ئەوانیان گەمارۆدا و ئەمانیان بەهیچ کەسێك نەدەدا. بەرم لەدورەوە لێیان دەدان بەلاّم رمەکان بۆ چەقین لەجەستەی ئەوان کورت بون. شکەست لەفێحل رویدا و کوشتار لە رەداغ. رۆمیەکان کەهەشتا هەزار کەس بون، کوشتار کران و جگە لەهەلاّتوان کەس رزگاری نەبو. خوا ئەوەی موسوڵمانان پێیان ناخۆش بو، بۆ ئەوانی ئاسان و دلگیر کرد. ئەوان حەزیان لەروبار و گێژاو و زۆلکاوەکان نەدەکرد و هەموی ئەمانە بوە یارمەتیدەری ئەوان دژی دوژمنەکانیان. سامانەکانی ئەوانیان بەتالاّنی برد و لەناو خۆیاندا دابەشیان کرد. ئەبوعوبەیدە خالید و هاورێکانی بۆ حمص گەڕاندەوە.
لەناو ئەو کەسانەی لەم شەڕەدا کوژران، سایب کوڕی حارس کوڕی قەیس کوڕی عودەی سەهمی بو. ئەو یەکێك بو لەهاوەلاّنی پێغەمبەر(ص).

## گرتنی سەرزەمینەکانی دەوروبەری دەمەشق

کاتێك ئەبو عوبەیدە، یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی وەك جێگری خۆی لەدەمەشق دیاری کرد وبەرەو فێحل بەرێکەوت، یەزید روی کردە شارەکانی صەیدا، عێرقە، جوبەیل و بەیروت کە لەکەنارەکانی دەمەشق (لەسەر قەراغ دەریایی سپی ناوەڕاست – مەدیتەرانە) جێگیرن. فەرماندەی پێشەنگەکانی براکەی معاویە بو. ئەم دوانە چەندین شاریان گرت و زۆر لەخەڵکانی ئەو شارانە کۆچیان کرد. معاویە خۆی، لەژێر سێبەری فەرمانڕەوایی یەزیدی برای، کاری گرتنی عەرقەی گرتە دەست. دواتر رۆمیەکان لەکۆتایی خەلافەتی عومەر وسەرەتای خەلافەتی عوسمان،بەسەر بەشێك لەم ناوچانە زاڵبونەوە. معاویە ئاهەنگی ئەو شوێنانەی کرد و دەستی بەسەردا گرتن وسەر لەنوێ دروستی کردنەوە و شەڕکەرانی لەوێ نیشتەجێ کرد و زەویەکانی بەوان بەخشی.
کاتێك عوسمان بوبەخەلیفە و معاویەی کردە فەرمانڕەوایی شام، سوفیان کوڕی مەجیبی ئەزدی رەوانەی تەرابلس کرد کەخۆی سێ شاری پەیوەست بەیەك بون. دواتر لەمەرج (سەرزەمینی پانی پرگیا) لەچەند مایلی ئەو شوێنە، قەلاّیەکی بەناوی قەلاّی ئەبوسوفیان دروست کرد و لەوشکانی و دەریاوە هۆکارەکانی ژیانی لەو خەلکە گرتەوە

و ئەوانی گەمارۆدا. کاتێك بازنەی گەمارۆدان گوشاری خستە سەر ئەوان، لەیەکێك لەقەلاکانی خۆیان کۆبونەوە و نامەیان بۆ پاشای رۆم نوسی و داوایان لێکرد هاوکاریان بکات یا چوارپێیان بۆ بنێرێت تا سواری بن و بۆ رۆم هەلبێن. ئەو چوارپێی فراوانی بۆ رەوانە کردن کەشەوانە سواری بون و رایان کرد. کاتێك سوفیان شەوی کردە رۆژ ( و ئەو بەمشێوەی دەکرد کەشەوانە لەگەلٚ موسولٚمانان لەقەلاکەدا بەسەری دەبرد و بەرەبەیان هێرشی دەکردە سەر دوژمن)، قەلاکەی بەخالٚی بینی و رۆشتە ناوی و هەوالٚی گرتنی قەلاکەی بۆ معاویە نوسی. معاویە دەستەیەکی زۆر لەجولەکەکانی لەوێ نیشتەجێ کرد. ئەمە ئەو شوێنەیە ئەمڕۆکە لەنگەرگەیەکی لێیە. لەوێ عەبدولەلیك کوڕی مەروان، دوبارە دروستی کردەوە و بەهێزی کرد. لەرۆژگاری عەبدولەلیك، خەلکی ئەوێ پەیمانی خۆیان شکاند و کوڕەکەی وەلید لەرۆژگاری خەلافەتی خۆی دەستی بەسەردا گرت.

## دەست بەسەردا گرتنی بەیسان و تەبەریە

کاتێك ئەبوعوبەیدە لەحمصەوە ئاهەنگی فێحلی کرد، شورەحبیل و هاورێکانی رەوانەی بەیسان کرد. ئەمان شەڕی خەلکانی ئەو ناوچەیان کرد و ژومارەیەکی فراوانیان لێکوشتن. پاشماوەکان لەسەر بنەمای ئاشتی دەمەشق پێشنیاری ئاشتیان پێکرد و رازی بو. ئەبوعوبەیدە پێشتر ئەعوەری بۆ تەبەریە ناردبو تا گەمارۆی ئەو شارە بدات. خەلکی ئەم شارەیش لەسەر بنەمای ئاشتی دەمەشق ئاشتیان لەگەلدا بەست و رازی بون مالٚ و سامانی خۆیان نیو بەنیو بەموسولٚمانەکان بسپێرن. فەرماندەکان بەنەسپەکانی خۆیان لەوێ دابەزین و هەوالٚی گرتنی ئەو شارەیان بۆ عومەر نوسی.

ئەبوجەعفەر دەلێت: جیاوازی هەیە لەوەی کە ئەم شەڕانە کامیان لەپێش ئەوانی دیکە رویداوە. هەندێك بەو شێوە ئاماژەیان پێدا کەئێمە باسمان کرد. دەستەیەکی دیکە دەلێن: کاتێك موسولٚمانان لەگرتنی ئەجنادین تەواو بون، هەلاتوان لەفێحل کۆبونەوە، لەبەر ئەمە موسولٚمانان ئاهەنگی ئەوێیان کرد و گەمارۆیاندان. ئەبو عوبەیدە ئەم فەرمانەی لەخالید شاردەوە تا ئاشتی لەدەمەشق بەسترا. پەیمانی ئاشتیان بەناوی

خالیدەوە نوسی. دواتر ئەبوعوبەیدە لەسەر کار لابردنی ئەوی ئاشکرا کرد. گرتنی فێحل لە زی قەعدە ساڵی ١٣ کۆچی / دێسامبری ٦٣٤ زایینی رویدا و گرتنی دەمەشق لەمانگی رەجەبی ساڵی ١٤ کۆچی /٦٣٦ زایینی رویدا. دوای ئەوە رۆمیەکان شەڕیان نەکرد. جیاوازی لەبەر ئەوە دروست بوە چونکە رودانی ئەم شەڕانە لەیەکەوە نزیك بون.

## راپۆرتی کاری موسەنا کوڕی حارسە و ئەبوعوبەیدە کوڕی مەسعود

پێشتر نوسیمان موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی لەعێراقەوە هاتە لای ئەبوبەکر وئەبوبەکر پێشنیاری بەعومەر کرد سوپایەکی لەگەڵدا رەوانە بکات. عومەر دوای بەسەربردنی یەکەم شەو لە بەخاك سپاردنی ئەبوبەکر، پێش هەر کارێك خەڵکی بۆ هاورێیەتی موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی بۆ شەڕ دژی خەڵکی فارس بانگێشت کرد و سێ رۆژ بەیعەتی لێ وەرگرتن و کەس بۆ شەڕ دژی ئێرانیەکان هەنگاوی نەدەخستە پێش. ئەوان گرانترین روخسارەکان بۆ موسوڵمانان بون و موسوڵمانان شەڕ دژی ئەوانیان پێ خۆش نەبو چونکە پاشایەتی ئەوان بەهێز و سەقامگیر و ئێرانیەکان بەردەوام خەڵکانی جیهانیان دەکردە فەرمانبرداری خۆیان. کاتێك رۆژی چوارەم گەیشت، عومەر خەڵکی بۆ رەوانە بون بەرەو عێراق بانگێشت کرد و یەکەم کەس ئەبو عوبەید کوڕی مەسعودی سەقەفی، باوکی موختار بو کەهەنگاوی بردە پێش و دواتر کەسانیتر بەرێکەوتن: سەعد کوڕی عوبەیدی ئەنساری، سەلیت کوڕی قەیس و بەدوای ئەوان خەڵکانیتر.

موسەنا کوڕی حارسە لەناو خەڵکەکەی دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، هەرگیز نابێت ئەم پانتاییە لەبەرچاوی ئێوە گەورە ودژوار بێت. ئێمە دێهاتەکانی ئێرانمان گرت و لەناو دوبەشەکەی (سواد) بەسەر بەشە باشەکەی زاڵبوین و زیانی زۆرمان لەواندا و بوێری ئەوان بوین. ئەگەر خوا بیەوێت، بەردەوامی ئەم کارە لەبەرژەوەندی ئێمە دەبێت و زیاتر لەم پانتاییە دەکەوێتە دەستی ئێمە. دواتر خەڵك کۆبونەوە. بەعومەر وترا: یەکێك لەپێشەنگەکان موهاجیر یا ئەنسار لەسەر ئەوان بکەرە فەرماندە. وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم، خوا پێگەی ئەوانی بۆیە بەرز

کردەوە کەپێش کەسانیتر هەنگاویان بردەپێش ولەشەڕ دژی دوژمن پەلەیان کرد. ئەگەر کەسانیتر بە ناڕاحەتیەوە ئەو کارەدەکەن، ئەوانەی بارقورس و سوك ئامادەی شەڕ دەبن و روبەروی دوژمن دەبنەوە، شیاوترن بۆ فەرماندەیی. سوێند بەخوا جگە لەوانەی پێش کەسانیتر بۆ شەڕ ئامادە بون، فەرماندەیی نابەخشم. دواتر ئەبوعوبەیدەی لەخۆی نزیك کردەوە و سەعد و سەلیتی بانگ کرد و بەم دوانەی وت: ئەگەر ئێوە دوانە پێش ئەو کەوتن، فەرماندەی بەئێوە دەبەخشم و ئێوەیش بەم کارە پێگەی خۆتان بەرز دەکەنەوە. ئەو فەرماندەیی بەئەبوعوبەید بەخشی و وتی: گوێ لەقسەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بگرە وئەوان لەفەرماندەییدا بەشدار بکە. ئەوەی رێگر بو لەوەی فەرماندەیی بەسەلیت نەبەخشم، ئەوە بو ئەو لەدەست پێکردنی شەڕ پەلە دەکات و پەلە کردن لەشەڕ هۆکاری لەناوچونی عەرەبەکانە. ئەم کارە شیاوە بۆ پیاوێك لەکارەکان تێفکرێت. دواتر پێشنیاری پێکرد لەگەڵ سوپاکەی ژێر فەرمانی خۆی بەباشی هەڵس وکەوت بکات. رەوانە کردنی ئەبوعوبەید یەکەم کارێك بو عومەر بۆ دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکانی دیکە کردی. دوای ئەوە، یەعلی کوڕی مونیەی بۆ یەمەن نارد و فەرمانی پێدا لەسەر بنەمای فەرمانی پێغەمبەر(ص) خەڵکی نەجران دەرپەڕێنێت چونکە پێغەمبەر(ص) فەرموبوی، نابێت لەدورگەی عەرەبی زیاتر لەیەك دین بونی هەبێت، مانەوەی ئەم دو دینە لێرە پێکەوە شیاو نیە.

## بەسەرهاتی ئەمارق

لەم کاتەدا، ئەبو عوبەیدی سەقەفی وسەعد کوڕی عوبەید و سەلیت کوڕی قەیس (ئەم دوانە لەئەنسار) و موسەنا کوڕی حارسە، پیاوێك لەبەنی هیند لەمەدینە رەوانە بون. عومەر فەرمانی بەموسەنادا پێش کەسانیتر بەرێکەوێت تا هاوەڵەکانی پەیوەستی دەبن. فەرمانی بەواندا لەدین هەڵگەڕاوەکان (دوای مردنی پێغەمبەر(ص)) ئەوانەی بڕوایان بەهێز بوە، بۆ شەڕ هانبدەن، ئەو کارەیان کرد. موسەنا بەرێکەوت و لەحیرە دابەزی. ئێرانیەکان لەم کاتەدا لەموسوڵمانەکان بێ ئاگابون وسەرقاڵی گرفتاریەکانی خۆیان بون چونکە شەهریران مردبو و ماوەیەکی خایاند تا ئەوان لەسەر پاشایەتی شاپور کوڕی شەهریار کوڕی ئەردەشێر رێککەوتن. ئازەرمیدوخت دژی راپەڕی و لەگەڵ فەرۆخ زاد

ئەوی کوشت و پوران بەپاشایەتی گەیشت.

ئەم خاتونە رێبەری خەڵکی گرتە ئەستۆ تا بتوانن لەسەر پاشایەتی یەکێك لەبنەماڵەی پاشاکان رێککەون. هەواڵی ئەم کارەی خۆی بۆ رۆستەمی فەرۆخ زاد نوسی و داوای لێکرد لەهاتن پەلە بکات. ئەو فەرماندەی بنکە سنوریەکانی خوراسان بو. رۆستەم بەرەو پایتەخت بەرێکەوت ولەسەر رێگای خۆی، روبەروی هەر سوپایەکی ئازەرمیدۆخت دەبویەوە، تێکی دەشکاند و سەرئەنجام خۆی بەمەداین گەیاند. شەڕ دەستی پێکرد و سیاوەخش شکەستی خوارد و رۆستەم ئەو و ئازەرمیدۆختی لەمەداین گەمارۆدا. دواتر رۆستەم دەستی بەسەر شاری مەداینـدا گرت و سیاوەخشی کوشت و چاوی ئازەرمیدۆختی کوێر کرد وپورانی لەسەر تەخت دانیشاند لەسەر ئەو بنەماییەی کە بۆماوەی دەساڵ پاشایەتی بکات و دواتر پاشایەتی بۆ بنەماڵی خوسرەو بگەڕێتەوە، و ئەگەر کوڕێك لەو بنەماڵەیە دەست کەوت، بکرێتە پاشا و گەرنە پاشایەتی بکەوێتە دەست ژنەکانی بنەماڵەی خوسرەو.

ئەم خاتونە سنوردارەکانی ئێرانی بانگ کرد و فەرمانی پێدان گوێ لەفەرمانەکانی رۆستەم بگرن و لەبەرابەر ئەوسەری کوڕنوش دانەوێنن. دواتر تاجی لەسەر نا. پێش هاتنی ئەبوعوبەید، ئێرانیەکان فەرمانبرداری رۆستەم بون. ئەو ئەستێرەناسێکی شارەزا بو و چۆنیەتی روداوەکانی دەزانی. یەکێك پێی وت: بۆ ئەم کارەت کرد لەکاتێکدا دەتزانی کاروبارەکان چۆن دەڕواتە پێش؟ وتی: بۆ رێز گرتن لەشەرەف بو ئەو کارەم کرد.

موسەنا دوای دەرۆژ گەیشتە حیرە و ئەبوعوبەید یەك مانگ دوای ئەو. رۆستەم بۆ دێدارەکانی نوسی لەبەرابەر موسوڵمانەکان شۆڕش بکەن. بۆ هەر شار و دێهاتێك پیاوێکی رەوانە کرد تا خەڵکی ئەوێ بۆ شۆڕش هانبدات. جابانی بۆ فوراتی بادەقلی نارد و ئەرسی بۆ کەسکەر رەوانە کرد. رۆژێکی لەگەڵ ئەوان هەڵبژارد و کردیە رۆژی بەیەك گەیشتن و کۆبونەوە. یەکێك لەسوپاکەی خۆی بۆ شەڕی موسەنا رەوانە کرد. هەواڵی ئەم کارە بەموسەنا گەیشت و ئەو ئاگادار بویەوە. جابان پێشدەستی کرد و لەئەماروق دابەزی. ئێرانیەکان لەشوێنەکانی خۆیان هەستان و هەمویان بەدوای یەك شۆڕشیان هەڵگیرساند، خەڵکی شارەکان ودێهاتەکان لە سەرەوە تا خوارەوەی فورات

شۆڕشیان دەست پێکرد. موسەنا لەحیرە ڕۆشتەدەر و لەخەفان دابەزی تا لەپشتەوە زیانی بەرنەکەوێت. لەوێ مایەوە تا ئەبوعوبەید پەیوەستی بو. کاتێك گەیشت، دابەزی تا خۆی و هاوەڵانی وچان بگرن. دەستەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری جابان کۆبونەوە. ئەو لەنەماروق دابەزی. ئەبوعوبەید روبەروی بویەوە و موسەنای کردە فەرماندەی سوارەکان. لەسەر دو باڵی راست و چەپی سوپاکەی جابان، جەشنەس ماە و مەردان شا فەرماندە بون. دو سوپا لەنەماروق شەڕێکی قورسیان بەرێخست. خوا خەڵکی ئێرانی شکەستدا و جابان ئەسیر کرا. ئەو بەدەستی مەتەر کوڕی فیزەی تەمیمی ئەسیر کرا. مەردان شایش گرفتار بو. ئەکتەل کوڕی شەماخی عوکەلی ئەوی ئەسیر کرد و دواتر کوشتی.

جابان مەتەری فریودا وپێی وت: ئایا حەز دەکەیت من ئەمان بدەیت و من کۆیلەی مو لێ ئەرواوت پێ ببەخشم و ئەمەو و ئەوەت بۆ بکەم؟ ئەو رزگاری کرد. موسوڵمانان ئەویان گرت و بردیانە لای ئەبو عوبەید و وتیان ئەوە جابانە دەبێت بکوژرێت. ئەبوعوبەید وتی: من لەخوا دەترسم ئەو بکوژم چونکە پیاوێکی موسوڵمان ئەمانی داوە و موسوڵمانان وەك یەك جەستەی تاقانەن. ئەوەی یەکێکیان ئەنجامی بدات لەسەر هەموان پێویستە و ئەوەی بکەوێتە ئەستۆی یەکێکیان، لەئەستۆی هەمواندایە. ئەوان دەستیان لێ هەڵگرت. ئەبوعوبەید سوپایەکی بەدوای تێکشکاوەکاندا نارد و تا ناو سوپاکەی ئێرسی راویان نان و کوشتاریان کردن.

## شەڕی سەقاتیە لەکەسکەر

تێکشکاوان پەیوەستی کەسکەر بون کەئێرسی لەوێ بو. ئەو کوڕە پوری پاشا بو. ئەو (ئەرسیانی) هەبو و ئەمە جۆرە خورمایەکە رێزی لێدەگرن و جگە لەپاشای ئێران کەئەو بەرێز دادەنێن، کەس لێی ناخوات. جگە لەوان کەس ئەو دار خورمایە ناڕوێنێت. لەم کاتەدا فیل سوارەکان هاتنە لای ئێرسی و ئەو لەخێوەتگەکەی خۆی بو. ئەبوعوبەید لەنەماروق بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و لەکەسکەر لای ئێرسی دابەزی. موسەنا بەهەمان ئەندازە بۆ شەڕ ئامادە بو کە لەنەماروق شەڕی کرد. لەسەر دو باڵی چەپ و راستی سوپاکەی ئێرسی بەندویە و تیرویە کوڕەکانی بەستام (خاڵی پاشا)

فەرماندە بون و خەڵکانی زوابی و باروسما ئەوانیان هاوڕێیەتی دەکرد. کاتێك هەواڵی جابان و تێکشکانی ئەو بەگوێی رۆستەم و پوران گەیشت. جالینوسیان بۆ لای نێرسی نارد تا پێش دەسپێکردنی شەڕ پەیوەستی بێت. ئەبوعوبەید لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەوان کرد و روبەرویان بویەوە. لەخوارەوەی کەسکەر لەشوێنێك بەناوی سەقاتیە روبەروی یەك بونەوە و شەڕێکی گەرم و دژواریان دەست پێکرد. ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و نێرسی هەلآت و موسوڵمانەکان بەسەر سوپا و سەرزەمینەکەی ئەو زاڵبون و تالآنیەکانیان کۆکردەوە. ئەبوعوبەید خواردەمەنی زۆری بینی و لەناو عەرەبەکانی دەوروبەری خۆی دابەشی کرد. دەستی بەسەر نەرسیاندا گرت و دەرخواردی جوتیارانیاندا وپێنج یەکیان بۆ عومەر نارد وبۆیان نوسی: خواوەند خواردنێکی بەئێمە بەخشی کەخوسرەوەکان رێزیان لێدەگرت و نەیاندەهێشت خەڵك دەستی پێی بگات و ئێمە حەزمان کرد ئێوە ببینن تا خواوەند بۆ بەخشینەکانی سوپاس بکەن. ئەبوعوبەید مایەوە.

ئەبوعوبەید موسەنای بەرەو باروسما نارد و والقی بەرەو زوابی و عاصمی بەرەو جەوبەر رەوانە کرد. ئەوان، ئەو کەسانەی کۆببونەوە، تێکیان شکاندن و ئەوەی توانیان وێرانیان کرد و خەڵکانیان بەئەسیری گرت. فەروخ و فەراوەنداد بەپەلە لەلایەن خەڵکی زوابی و کەسکەر و باروسما پێشکەشیان هەلگرت کەئەوان وەریانگرت و پەیمانی ئاشتیان بەست. فەروخ و فەراوەنداد هەمو جۆرە خواردن و شیرینیەکیان بۆ ئەبوعوبەید هێنا. وتی: ئایا بەمشێوەیە رێزتان لەسوپاکەی من گرت؟ وتیان: نەمانتوانی و بەزوترین کات ئەو کارە دەکەین. ئەوان چاوەڕوانی گەیشتنی جالینوسیان دەکرد. ئەبوعوبەید وتی: ئێمە پێویستمان بەوانە نیە. خراپ پیاوێکە ئەبوعوبەید ئەگەر هاورێ لەگەڵ خەڵکانێك لەسەرزەمینەکانی ئەوان بێتەدەر و دواتر شتێك هەڵبژێرێت و تایبەتی بکات بەخۆی. سوێند بەخوا ئەوەی هێناوتانەو ئەوەی خوا بەئێمەی بەخشیوە، لێی ناخۆم تا هەمو خەڵکان لێی دەخۆن. کاتێك جالینوس شکەستی خوارد دوبارە لەو شیرینیەیان بۆ هێنایەوە و وتی: من بێ موسوڵمانان لێو لەمە نادەم. وتیان: هیچ کام لەهاورێیانی تۆ نامێنێتەوە مەگەر ئەوەی لەمە بخوات. لەم کاتەدا دەستی بەخواردن کرد.

## شەڕی جالینوس

کاتێك ڕۆستەم جالینوسی ڕەوانە کرد، فەرمانی پێدا بەنێرسی دەستپێبکات و دواتر ڕوبەڕوی ئەبوعوبەید ببێتەوە. ئەبوعوبەید پێش ئەو هێرشی کردە سەر نێرسی و سوپاکەی ئەوی تێکشکاند. جالینوس گەیشت و لە باقسیاسا لەباروسما دابەزی و ئەبوعوبەید بەئامادەیی بۆ شەڕ ڕوبەڕوی بویەوە. لەوێ ڕوبەڕوی یەك بونەوە و بۆ شەڕ وەستان. موسوڵمانان ئەوانیان تێکشکاند و جالینوس ڕایکرد و ئەبوعوبەید بەسەر سەرزەمینەکانی ئەوان زاڵبو. دواتر کۆچی کرد ورۆشت و لەحیرە دابەزی. عومەر پێشتر پێی وتبو، تۆ دەڕۆیتە ئەو پەڕی سەرزەمینی فرێو و فێڵ و خیانەت و لەخۆرازی بون، دەڕۆیتە سەر ئەو خەڵکانی بۆ خراپە بێ شەرم بون و دەستیان بەئەنجامدانی کردوە، فێری باشی نەبون و ئەگەر فێربون، لەبیریان کردوە. ئاگات لەخۆت بێت. ڕێ لەزمانت بگرە و نهێنیەکانت مەدرکێنە. هەڵگری ڕاز تا ئەو کاتەی بەنهێنی بیهێڵێتەوە، پارێزراو و لەو شوێنەی کەنابێت، زیانی بەرناکەوێت، کاتێك نهێنیەکەی خۆی ئاشکرا بکات، لەگەڵ ئاشکرا کردن بەرەو لەناوچون دەڕوات.

## شەڕی قوس ناتف ( شەڕی جسر یا مەروەحە)

## کوژرانی ئەبوعوبەید کوڕی مەسعود

کاتێك جالینوس شکەستی خوارد و لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ لای ڕۆستەم گەڕایەوە، ڕۆستەم پێی وت: کام دەستە لەئێرانیەکان بۆ سەر عەرەبەکان سەختگیرن؟ وتی: بەهمەن جادویە ناسراو بەناوی (برۆ بەستراو) بۆیە پێیان دەوت برۆ بەستراو چونکە برۆکانی خۆی بەپەڕۆیەك دەبەست و بەرزی دەکردەوە، لەبەر پیری برۆکانی دەکەوتنە سەرچاوەکانی. ڕۆستەم ئەوی لەگەڵ فیلەکان ڕەوانە کرد و جالینوسی لەگەڵ ئەو گەڕاندەوە و بەبەهمەنی وت: ئەگەر جالینوس دوبارە شکەستی خوارد، لەملی بدە. بەهمەن جادویە لەگەڵ ئاڵای کاویان (ئاڵای شاکان) گەڕایەوە. ئەم ئاڵایان لەپێستی پڵنگ دروست کردبو. پانایەکەی هەشت گەز و درێژیەکەی دوانزە گەز بو. ڕۆشتە قوس

ناتیف و لەوێ دابەزی. ئەبوعوبەید روی تێکرد و لەمەروحە دابەزی. (دومە) هاوسەردکەی ئەو و دایکی کوڕەکەی موختار لەخەودا بینی پیاوێك بەتۆنگێکی لێوانلێو لە خورادنەوە لەئاسمانەوە هات کەئەبو عوبەید و چەند لەهاورێکانی لەو شەرابەیان خواردەوە و ژن خەوەکەی بۆ ئەبوعوبەید گێڕایەوە. ئەبو عوبەید وتی: ئەگەر خوا بیەوێت، ئەمە نیشانەی کوژرانی منە. ئەو پێشنیاری بەخەڵکەکەی خۆی کرد و وتی: ئەگەر من کوژرام، فلاّن کەس فەرماندە بێت و ئەگەر ئەویش کوژرا، فلاّن کەس تا ناوی هەمو ئەو کەسانەی برد کە لەو شەرابەیان خواردبو. دواتر وتی: ئەگەر ئەویش کوژرا، موسەنا فەرماندەیی بگرێتە دەست.

بەهمەن جادویە پەیامی بۆ نارد کە: یا بەلای ئێمە تێدەپەڕێت و ئێمە رێگە دەدەین تێپەڕیت یا رێگە بەئێمە دەدەیت لای ئێوە تێپەڕین. خەڵك رێگەی تێپەربونیان لێگرت و سەلیت ئەوی لەم کارە بەدور گرت. ئەو سەرسەختی کرد و بۆچونی راستی پشت گوێ خست و وتی: نابێت ئەوان بۆ مردن لەئێمە بوێرتر بن. ئەو لەسەر جسرێکەوە تێپەڕی کە کوڕی صەلوبا بۆ هەردو دەستەکەی دروست کردبو. زەوی بۆ خەڵك تەنگ و شەڕێکی دژوار دەستی پێکرد. کاتێك ئەسپی عەرەبەکان بەفیلەکان و ئەسپە ئێرانیەکان سەیریان کرد، شتێکیان بینی کەهاوشێوەکەیان نەبینیبو. لەبەر ئەمە هەر کاتێك موسوڵمانان ئاهەنگی ئەوانیان دەکرد، ئەسپەکانیان هێرشی نەدەکرد و کاتێك ئێرانیەکان بەفیلەکانی خۆیان هێرشیان دەکردە سەر موسوڵمانان، ئەسپەکان بلاّوەیان بەوان دەکرد و دەستە شەڕکەرەکان لێك دەپچڕان و هاوشێوەی باران زوبین بارانیان دەکردن. کار بۆ موسوڵمانەکان دژوار بو. ئەبوعوبەید و خەڵك دابەزین و شمشێریان خستە ناو ئێرانیەکان. فیل سوارەکان هێرشیان نەدەکرد سەر هیچ دەستەیەك مەگەر ئەوەی پاشەکشێیان پێدەکردن. ئەبوعوبەید هاواری کرد: گەمارۆی فیلەکان بدەن و بەندی زینەکانی ئەوان بەشمشێر بپچڕێنن و فیل سوارەکان بخەنە خوار. ئەو هێرشی کردە سەر فیلێکی سپی و بەندی زینەکەی پچڕاند و سوارەکەی خستە خوار. خەڵکیش ئەو کارەیان کرد و هیچ فیلێکیان نەهێشتەوە مەگەر ئەوەی بەندەکانیان پچڕی و زینەکانیان لێکردەوە و سوارەکانیان کوشت. فیلەکە روی لەئەبو عوبەید کرد کەبەشمشێر لێیدا بەلاّم فیلەکە بەدەست ئەبو عوبەیدی دا بەزەویدا و بەقاچ کوتای و

ئەوی تێکشکاند و لەسەر جەستەی وەستا. کاتێك خەڵك ئەویان لەژێر قاچی فیلەکە بینی، ترس دڵی ئەوانی لێوانلێو کرد. دواتر ئاڵاکە ئەو کەسە هەڵیگرت کەئەبو عوبەید دوای خۆی وەك فەرماندە دیاری کردبو. ئەو روبەروی فیلەکە بویەوە تا لەسەر جەستەی ئەبوعوبەد لاچو. موسوڵمانەکان ئەویان هەڵگرت و لەگۆڕەپانی شەڕ بردیانەدەر. دواتر ئەو کەسەی دوای ئەبو عوبەید فەرماندە بو، کوژرا و حەوت کەس لەخەڵکانی بەنی سەقیف یەك لەدوای یەك ئاڵاکەیان هەڵگرت و شەڕیان کرد تا کوژران. دواتر موسەنا ئاڵاکەی هەڵگرت و خەڵك دەستیان بەهەڵاتن کرد.

کاتێك عەبدالله کوڕی مورسەدی سەقەفی بینی چی بەسەر ئەبو عوبەید و جێگرەکانی هاتوە و خەڵك چ هەڵس و کەوتێکیان گرتۆتەبەر، پێش ئەوان کەوتەوە و ڕۆشتە سەر پردەکە و کردی بەدولەت. دواتر وتی: ئەی خەڵکینە، لەسەر ئەوی فەرماندەکانتان گیانیان بەخشی، گیان ببەخشن یا ڕێگەیەك بگرنە بەر سەرکەوتنی بەدواوە بێت. بتپەرستەکان موسوڵمانانیان بەرەو پردەکە پاشەکشێ پێکرد کەهەندێکیان خۆیان هەڵدایە ناو ئاوی فورات و خنکان و هەندێکیان لەژێر گوشاری شمشێری دوژمن گرفتار بون. موسەنا و چەندین سوار لەموسوڵمانان، پاسەوانی خەڵکیان کرد و وتیان: ئێمە قەڵغان و پشتیوانی ئێوەین، بەئارامی تێپەڕن و خۆتان مەخەنە ناو ئاوەکە. عوروە کوڕی زەید ئەلخەیل و ئەبو میحجەنی سەقەفی بەقورسی شەڕیان کرد و پیاوانە تێکۆشان و ئەبو زەیدی تایی ئازایانە شەڕی کرد. ئەو پیاوێکی خۆپارێز بو کەبۆ ئەنجامدانی کارێك هاتبوە حیرە. موسەنا پێی وت: هەرکەس تێپەڕێت بەسلامەتی ڕزگاری دەبێت. لەم کاتەدا پیاوە بە هێز و چوارشانەکان هاتن و پردێکیان هەڵبەست و خەڵك تێپەڕین.

دوایین کەس کە لەنزیك پردەکە کوژرا، سەلیت کوڕی قەیس بو. موسەنا تێپەڕی و فەرماندەیەکەی خۆی پاراست. کاتێك تێپەڕی کرد خەڵك لەدەوری ئەو بلاوەیان لێکرد و موسەنا لەگەڵ دەستەیەکی کەم مانەوە. ئەو بریندار ببو و چەندین ئاڵقە لەزرێکەی لەجەستەی چەقیبو.

بەعومەریان وت کەئەو دەستانە لەخەڵك کەهەڵاتون، لەشەرما بەشارەکاندا بلاو بونەتەوە.. ئەم قسەی پێ ناخۆش بو. وتی: ئەی خوایە، هەر موسوڵمانێك لای من ڕێگە

چاردیەکی هەیە، من پشتیوانی هەر موسوڵمانێکم، خوا لەئەبو عوبەید خۆش بێت! ئەگەر پشتی بەمن دەبەست، منی وەك پشتیوانی خۆی دەبینی.

لەموسوڵمانان چوار هەزار کەس (ج کوژراو وج ئەوانەی لەناو ئاودا خنکان) لەناوچون. دوهەزار کەس رایان کرد و سێ هەزار کەس مانەوە. لەئێرانیەکان شەش هەزار کەس کوژران. بەهمەن جادویە ئاهەنگی ئەوەی کرد تێپەڕێت و شوێن موسوڵمانەکان بکەوێت بلاّم هەواڵی پێگەیشت ناسازگاری لەناو ئێرانیەکان دروست بوە. خەڵك دژی رۆستەم شۆڕشیان کردبو و پەیمانەکەیان لەگەڵ ئەو خستبوە ژێرپێ و ببون بەدودەستە: پەهلەویەکان لەدەوری رۆستەم کۆببونەوە و خەڵکی فارس لەدەوری فیروزان. ئەو بۆ مەداین گەڕایەوە.

ئەم روداوە لەمانگی شەعبان /ئۆکتۆبەری ٦٣٤ زایینی رویدا.

لەناو ئەو کەسانەی لەسەرپردەکە کوژران، دەتوانین ناوی ئەمانە بێنین/ عەبداللە و عەقەبە کوڕی قبتی کوڕی قەیس لەشەرکەرانی ئوحۆد، براکەیان عیباد کە لەشەڕی ئوحۆد بەشدار نەبو. قەیس کوڕی سەکەن کوڕی قەیس ئەبوزەیدی ئەنساری لەبەدریەکان کەمناڵی نەبو، یەزید کوڕی قەیس کوڕی حوتەیمی ئەنساری لەشەرکەرانی ئوحۆد، ئەبو ئومەییە فەزاری لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص)، حەکەم کوڕی مەسعود برای ئەبوعوبەید و کوڕەکەی جەبر کوڕی حەکەم کوڕی مەسعود.

## بەسەرهاتی ئۆلەیسی بچوك

کاتێك برۆ بەستراو گەڕایەوە، جابان و مەردان شا نەیانزانی ج هەواڵێکی پێ گەیشتوە. ئەو دوانە ڕۆشتن و سەرە رێگایان لێگرت. هەواڵی ئەم کارە بەموسەنا کوڕی حارسە گەیشت کەعاصم کوڕی عەمرۆی وەك جێگری خۆی دیاری کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەشەرکەران ئاهەنگی ئەوانی کرد. ئەو دوانە گومانیان کرد ئەو هەڵدێت و لەبەر ئەمە ئاهەنگی ئەویان کرد. موسەنا ئەو دوانەی بەئەسیری گرت و خەڵکی ئۆلەیس هێرشیان کردە سەر هاوەڵانی ئەو دوانە و هەمویان بەدیلی گیران. لەوێ بۆ ئەوان پەیمانی ئەمان بەسترا و موسەنا ئەو دوانە و ئەسیرەکانی کوشت. ئەبو میحجەن لەئۆلەیس هەلاّت و لەگەڵ موسەنا کوڕی حارسە نەگەڕایەوە.

## شەڕی بوەیب

کاتێك هەواڵی شەڕی ئەبوعوبەید لەسەر پردەکە بەعومەر گەیشت، خەڵکی بانگێشت کرد تا هاوکاری موسەنا بکەن. لەناو ئەو کەسانەی فەرمانی رۆشتنی پێدا، بەجیلە بو. کاری ئەوانی بەجەریر کوڕی عەبدالله سپارد چونکە ئەو، ئەو خەڵکانەی لەناو هۆزەکان بڵاو ببونەوە، کۆکردبویەوە. ئەو داوای فەرمانێکی لەپێغەمبەر(ص) کردبو تا خەڵك کۆبکاتەوە و پێغەمبەر(ص) مژدەی پێبەخشیبو. کاتێك ئەبوبەکر هاتە سەر کار، گوێی لەداواکەی ئەو نەگرت. کاتێك عومەر هاتەسەر کار، داوای بەدیهێنانی مژدەکەی پێغەمبەر(ص)ی لێکرد و عومەر بۆ کارگوزارانی خۆی نوسی: هەر کەسێك لەرۆژگاری جاهلی باوەڕهێنانەکەی بۆ بەجیلە دەگەڕێتەوە و لسەر باوەڕەکەی خۆی ماوەتەوە، بۆ لای بەجیلە بنێرن. ئەو کارەیان کرد. کاتێك کۆبونەوە، عومەر فەرمانی پێدان رەوانەی عێراق ببن بەڵام ئەوان لەرۆشتن جگە بۆ شام خۆیان بەدور گرت. عومەر بۆ ڕۆشتن بۆ عێراق سوێندی خوارد و بەڵێنی پێدان یەك لەسەر چواری پێنج یەکی تاڵانیەکانیان پێببەخشێت. ئەوان رازی بون و عومەر ئەوانی بۆ لای موسەنا کوڕی حارسە نارد. هەروەها عەسمە کوڕی عەبداللەی زەببی لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ لای موسەنا رەوانە کرد. بۆ لەدین هەڵگەڕاوەکان پەیامی نارد و هەرکەس هات بۆ لای موسەنای رەوانە کرد. موسەنا نێردراوانی خۆی بۆ عەرەبەکانی دەوروبەری رەوانە کرد کە لەگەڵ دەستەیەکی زۆر گەڕانەوە لای. لەناو ئەو کەسانەی پەیوەستی بون، ئونس کوڕی هیلالی نەمری لەگەڵ سوپایەکی گەورە لە مەسیحیەکان هۆزی نەمر کەوتیان: شان بەشانی خەڵکەکەی خۆمان شەڕدەکەین.

هەواڵی ئەم کارە بەرۆستەم و فیروزان گەیشت و ئەم دوانە مێهرانی هەمەدانیان بۆ حیرە رەوانە کرد. ئەم هەواڵە بەگوێی موسەنا گەیشت و ئەو لەناو خەفان و قادسیە بو. لەبەر ئەمە ڕۆشتە قوڵایی فورات بادەقلی و کردی بەپشتیوانی خۆی و بۆ جەریر و عەسمە و هەر کەسێك بۆ هاوکاری هاتبو، نامەی نوسی وئەوانی لەراپۆرتی کارەکە ئاگادار کردەوە و فەرموی ئاهەنگی بوەیب بکەن چونکە شوێنی بەیەك گەیشتن ئەوێیە. ئەوان ڕۆشتنە لای موسەنا لەبوەیب و مێهران لەوبەری فورات لەبەرابەریدا بو. موسوڵمانان لەبوەیب، لەنزیك کوفەی ئێستا کۆبونەوە. مێهران بۆ موسەنا پەیامی نارد

کە: یا لای ئێمە تێپەڕن یا ئێمە لای ئێوە تێدەپەڕین. موسەنا وتی: تێپەڕن.
مێهران تێپەڕی و لەسەر لێواری فورات دابەزی. موسەنا هاوەڵەکانی بۆ شەڕ ئامادە کرد و ئەمە لەمانگی رەمەزان/ نۆڤەمبەری ٦٣٤ زایینی بو. بەوانی وت رۆژوەکانی خۆیان بشکێنن تا لەبەرابەر دوژمنان وزە بگرن. ئەوان رۆژوەکانی خۆیان شکاند. لەسەر دوباڵی چەپ و راستی سوپاکەی موسەنا بوسر کوڕی ئەبی رۆهم و بەشیر کوڕی خەصاصیە بون. فەرماندەی سوارەکانی براکەی و فەرماندەی پیادەکانی براکەی مەسعود و کۆتایی سوپاکەی لەژێر فەرماندەیی مەزعوردا بو. لەسەر باڵەکانی راست و چەپی مێهران کوڕی ئازادبە، مەردان شا و سنورداری حیرە بون. ئێرانیەکان لەسێ ریزدا پێشڕەویان دەست پێکرد و لەهەر ریزێك فیلێك و پیادەکان لەپێش فیلەکانەوە بون و ئەوان سرود خوێنەکان لەقەڵەم دەدران. موسەنا وتی: ئەوەی دەیبیستن نیشانەی ناکامەرانیە، کەواتە بێدەنگ بن.
دواتر لەموسوڵمانەکان نزیك بونەوە و موسەنا لەناو ریزەکانی خۆی بەسوڕانەوە سەرقاڵ بو. ئەوسوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی بەناو شەموس بو (چونکە زۆر نەرم و چابوك و چالاك بو بەم ناوە بانگ دەکرا).ئەو تەنیا کاتی شەڕ سواری ئەم ئەسپە دەبو. لای ئاڵادارەکان وەستا و یەك یەکیانی هاندا و بوێری پێ بەخشیتن و بەهەمویانی وت: هیوادرام ئەمڕۆ لەگۆڕەپانی شەڕ لەبەشەکەی ئێوە کەس نەتوانێت کەڵێن لەناو سوپای ئیسلامدا دروست بکات. سوێند بەخوا ئەمڕۆ هیچ شتێك خۆشحاڵم ناکات مەگەر ئەوەی لەبەرژەوەندی هەمواندا بێت. ئەوان وەڵامێکی شیاویان دایەوە. ئەو لەوتار و کردارەکانی، خۆشەویستی و گیان بەخشینی خۆی بۆ ئەوان نیشاندا. خەڵکان لەکارە دڵپەسەند و ناپەسەندەکان تێکەڵ بون وکەس نەیتوانی لەوتار و کردارەکانی ئەو رەخنە بگرێت. وتی: من سێ جار تەکبیر دەڵێم و ئێوە ئامادەی شەڕ بن و لەتەکبیری چوارەم هێرش بکەن. کاتێك یەکەم تەکبیری وت، سوارەیەك شڵەژا و هێرشی دەسپێکرد. ئەوان پەرێشان بون و سوارەکان و پیادەکان ماوەیەك درەنگیان کرد. موسەنا شێوە پەرێشانیەکی لەناو بەنی عێجلدا بینی. لەبەر ئەمە لەبەر کارەکانی ئەوان ریشی خۆی دەکێشا و پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان ناردکە: فەرماندە سڵاوتان لێدەکات و دەڵێت، ئەمڕۆ موسوڵمانەکان ریسوا نەکەن. وتیان: بەڵێ. ئەوان بەشێوەیەکی زۆر رازاوە

گەڕانەوە و موسەنا لەخۆشحاڵیدا پێکەنی.

کاتێك شەڕ قورس و خایاندی، موسەنا بەئۆنس کوڕی هیلالی نەمری وت: تۆ پیاوێکی عەرەب نەژادی هەرچەندە لەسەر ئایینەکەی ئێمە نیت، کاتێك هێرش دەکەمە سەر مێهران، تۆ لەگەڵ من هێرش بکە. ئەو رازی بو. موسەنا هێرشی کردە سەر مێهران و کەڵێنی لەباڵی راستی سوپاکەی دروست کرد. دواتر هەردولا روبەروی یەك بونەوە و دوڵی سوپاکە شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. باڵەکانی چەپ و راست کوشتار دەکران و نەیاندەتواتی خۆیان بۆ هاوکاری کردنی فەرماندەکەیان رزگار بکەن، نە موسوڵمانان و نە بتپەرستەکان. لەم رۆژەدا مەسعود برای موسەنا هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەگەورەکانی ئیسلام، بریندار و نیوەگیان لەگۆڕەپانی شەڕ برانەدەر. کاتێك مەسعود کەوت، هاورێکانی ئەو لەرز دایگرتن. وتی: ئەی خەڵکی بەکر، ئالاکەی خۆتان هەڵکەن، خوا ئێوە سەربڵند بکات، نەکات کەوتنی من ئێوە بترسێنێت. موسەنا بەوانی وتبو: ئەگەر بینیتان ئێمە کەوتین، واز لەکارەکەی خۆتان مەهێنن، بەهێزەوە پەیوەستی ریزەکانی خۆتان بن و هاوشێوەی دەوروبەرەکەی خۆتان پیاوانە تێبکۆشن و باری سەر شانی یەك سوك بکەن.

دڵی سوپای ئیسلام کەلێنی لەدڵی سوپای موسوڵمان دروست کرد. کۆیلەیەکی مەسیحی لەتەغلەب، مێهرانی کوشت و پەڕیە سەر ئەسپەکەی ئەو. موسەنا ساز و بەرگ و کەرەستەکانی شەڕ و جل و بەرگەکانی تایبەت کرد بەخاوەنی ئەسپەکەی. پیاوی تەغلەبی هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەبەنی تەغلەب، چەندین ئەسپیان بەدەست هێنا بو. کاتێك گەرمی شەڕیان بینی، هاتنە جۆش و دەستیان بەشەڕ کرد. دەڵێت: موسەنا دڵی سوپای بتپەرستانی تێکشکاند و باڵەکان یەکتریان کوشتار کرد. کاتێك بینیان دڵی سوپای ئێران کەلێنی تێکەوتوە و شەرکەرانیان لەناو بردوە، باڵەکانی موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر باڵەکانی بتپەرستان و ئێرانیەکانیان بۆ دواوە پاشەکشێ پێکرد. موسەنا لەگەڵ موسوڵمانان لەدڵی سوپاکە، لەخواوەند بۆ سەرکەوتنی ئەوان پاڕایەوە و چەندین کەسی بۆ لای ئەوان نارد تا زیاتر بۆ شەڕ هانیان بدەن. بەوانیان دەوت: پاسەوانی لەشێوەی هەمیشەیی خۆتان لەم جوامێریانەدا بکەن و هاوکاری خوا بکەن تا هاوکاری ئێوە بکات. سەرئەنجام ئێرانیەکانیان تێکشکاند. موسەنا پێش ئەوان کەوت و

بۆ لای پردەکە ڕۆیشت و ڕێگەی لەئێرانیەکان بەست. ئەوان بون بەچەندین دەستە و رویان لەسەر و خوار کرد. سوارەکانی سوپای ئیسلام ئەوانیان گەمارۆدا و کێویکیان لەجەستەی کوژراوەکان دروست کرد.

لەنێوان موسوڵمانەکان و ئێرانیەکان شەڕێك روی نەدا کەئەم هەمو کوژراوەی لێکەوتبێتەوە. ئێسقانی کوژراوەکان بۆ رۆژگارێکی درێژ بەکەڵەکەیی مانەوە. کوژراوەکانیان بەسەد هەزار کەس بەراوەردە دەکرد. ئەو رۆژەیان بەرۆژی (دەیان) ناو برد چونکە سەد شەڕکەریان ژودمارد کەهەرکام دە شەڕکەری کوشتبو. عوروە کوڕی زەید ئەلخەیل و غالب کەنانی و عەرفەجە ئەزدی لەوکەسانە بون کە نۆکەسیان کوشتبو. بتپەرستەکان لەنێوان سەکونی ئەمرۆیی و کەنارەکانی فورات کوشتار کران و موسوڵمانەکان ئەو رۆژە تا شەو و بەیانی تا ئێوارێ، شوێنیان کەوتن. موسەنا لەگرتنی ڕێگەی پردەکە پەشیمان بویەوە و وتی: سستی و لاوازی و ناڕاستیم لەخۆم نیشاندا کەخواوەند زیانەکەی لەئێمە دور خستەوە. پێش ئەوان خۆم گەیاندە پردە و ئەوانم خستە گرفتاریەوە. ئەی خەڵکینە، ئیتر ئەم کارە مەکەن چونکە ئەمە هەڵەیە. نابێت کەسێك کەپەنای نیە، بخرێتە دژواریەوە.

دەستەیەك لەبریندارەکان مردن، لەوان: مەسعود برای موسەنا و خالید کوڕی هەنان. موسەنا نوێژی لەسەر ئەوان خوێند و وتی: خەمی من بەوە ئارام دەبێتەوە کەئەوان خۆڕاگریان کرد و لەشەڕی بوەیب پیاوانە خۆڕاگریان کرد و سستیان لەخۆیان نیشان نەدا.

موسوڵمانان چەندین سەر مەڕ و بڕێك ئارد و چەند سەر مانگایان بەدەست هێنا و ئەوانیان بۆ لای بنەماڵەی ئەو کەسانەی لەمەدینەوە هاتبون وئێستا لەقوادس بون، ردوانە کرد. موسەنا سوارەکانی بەدوای ئێرانیەکاندا ردوانە کرد و ئەوان گەشتنە سیب و لەمانگاکان و ئەسیرەکان و تالآنیەکانی دیکە، ئەندازەیەکی فراوانیان دەست کەوت. موسەنا لەناو خەڵکدا دابەشی کرد و بەهرەیەکی بۆ خەڵکی شارەکان دانا و بەخەڵکی بەجیلە یەك چواری پێنج یەکەکەی بەخشی. ئەو کەسانەی بەدوا تێکشکاوەکاندا ڕۆشتبون، پەیامیان بۆ موسەنا نارد و ئاگاداریان کردەوە کەتەندروستن وهیچ لەمپەرێك بۆ بەدواداچونی ئەو خەڵکە نابینن و چاودێری فەرمانێکن تا بۆ پێشەوە بڕۆن. ئەو

فەرمانی پێدان. ئەوان هێرشیان برد تا گەشتنە سابات کەخەڵکەکەی لەقەڵاکاندا خۆیان شاردەوە و سوپای ئیسلام دێهاتەکانی کوشتار و تاڵان کرد و دواتر سوادیان تا دیجلە بڕی و هیچ زیان و لەمپەرێکیان نەبینی. پێگە سنوریەکانی ئێران گەڕانەوە و فەرمانبرداری خۆیان راگەیاند. ئێرانیەکان شاد بون کاتێك بینیان موسوڵمانەکان، ئەو بەری دیجلەیان بەوان سپاردوە.

## راپۆرتی خەنافس و بازاری بەغداد

دواتر موسەنا بەشیر کوڕی خەصاصیەی لەجێگاکەی خۆی لەحیرە دانا و دەستی بەبڕینی سەرزەمینەکانی سەواد کرد. سوپاییەکانی بۆ میشان و دەشتی میشان رەوانە کرد و پادگانەکانی دروست کرد ولە ئۆلەیس، دێهاتێك لەدێهاتەکانی ئەنبار، دابەزی. ئەم شەڕەیان بەدوایین شەڕی ئەنبار، هەروەها بەدوایین شەڕی ئۆلەیس ناوبردوە.
لەم کاتەدا دو پیاو هاتنە لای موسەنا. یەکیان ئەنباری بو کەرێگەی بازاری خەنافسی پێ نیشاندا و ئەویتر حیری کەرێگەی بەغدادی پێنیشاندا. موسەنا پرسی: کام یەك لەم دوانە پێش ئەویترە؟ وتیان: لەنێوان ئەم دو شوێنە چەند رۆژ رێگەیە. پرسی: کامیان خێراتر دەستی بەسەردا دەگیرێت؟ وتیان: بازاری خەنافس، لەوێ بازرگانەکانی مەداینی خوسرەو کۆدەبنەوە و بازرگانەکانی سواد ئاڵوگۆڕ دەکەن و شەڕکەرانی رەبیعە و قوزاعە پاسەوانیان دەکەن. موسەنا سوار بو و لەرۆژێك کەبازاری خەنافس گەرم بو و سوارەکانی هۆزی رەبیعە و قوزاعە بۆ پاسەوانی وەستابون، هێرشی کرد. سەرکردەی سوپاکەی قوزاعە، رۆمانس کوڕی وەبەرە بو و فەرماندەیی رەبیعە لەدەستی سەلیل کوڕی قەیس و ئەوان پاسەوانەکانی ئەو بازارە بون. ئەو بازار و هەمو شتەکانی وێرانکرد و تاڵانی کرد و پاسەوانەکانی کوشتار کرد و دواتر هاتە ئەنبار کەخەڵکەکەی لەقەڵاکاندا خۆیان شاردەوە. کاتێك ئەویان ناسیەوە، هاتنە لای و بۆ چوارپێکانی ئەو خواردن و ئاویان هێنا. لەناو ئەوان رێنیشاندەرەکانی هەڵگرت و لەبەرابەر دێدارەکانی ئەنبار وای نیشاندا کەناهەنگی مەداینی هەیە. لەوێ شەوانە بەرەو بەغداد رۆشت و لەئاوی ، زێ تێپەڕی کرد و بەرەبەیان لەگەرماو گەرمی بازار هێرشی کردە سەر ئەوان و شمشێری خستە ناویان و هەرچی توانی تاڵانی هەڵگرت. موسەنا وتی: جگە لەزێر و

سیم و کالاّ سوك و گرانبایییەکان شتی دیکە هەڵمەگرن. دواتر رێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر و لەکەنارەکانی روباری (سالّحین) لەئەنبار دابەزی. لەهاوەڵانی خۆی بیست کەدەڵێن: ئەگەری هەیە بەم زوانە ئەم خەڵکە شوێن ئێمە بکەون. قسەی بۆ ئەوان کرد و وتی: سوپاسی خوا بکەن و داوای تەندروستی و رزگاری گیانی خۆتان لەوبکەن و ئەگەر وتەیەك بەگوێی یەکدا دەچرپێنن، دەبێت سەبارەت بەچاکەکاری و خۆپارێزی بێت. وتەی چرپە کەهوکاری گوناهـ و توند و تیژیە، مەهێننە سەر زمان، لەکارە باشەکان بڕوانن وبەراوەردیان بکەن و ئەوسا دەم بۆ قسەکردن بکەنەوە. بزانن هێشتا ئاگادار کەرەوە بەشارەکەی ئەوان نەگەیشتوە و ئەگەر گەشتبێت، ترس رێگر دەبێت لەبەدواداچونی ئێوە. هێرش بردن و تالآن کردن، ترسێکی هەیە کەدڵەکان لاواز دەکات و تالآن کراوەکان شەو ورۆژێك پەرێشان. ئەگەر پاسەوانەکانیش ئێودیان ببینیبێت و شوێن ئێوە کەوتبێتن، ناتوانن بتانگرن چونکە ئێوە سوار چوارپێ چالاکە ڕەسەنەکانن. ئەگەر بەئێوە بگەن، من بێ گومان بۆ وەرگرتنی پاداشتی خوایی و بەهیوایی سەرکەوتن شەڕی ئەوان دەکەم. کەواتە پشت بەخوا ببەستن و بیری چاکە لەخوا بکەنەوە کە لەزۆر شەڕەکان هاوکاری ئێوەی کردوە.

دواتر ئەوانی بۆ ئەنبار برد، ئەو موسوڵمانانەی لەپشت سەری ئەو بون، پاسەوانی سوادیان کرد و هێرشیان دەهێنا و لەنێوان فورات و خواردوەی کەسکەریان تالآن کرد. دواتر پیاوێکی ئاگا و رێگەناسیان بۆ گەیشتن بەعەین ئەلتەمر و سەرزەمینی فەلالیج دەست کەوت و موسەنا لەئەنبار بو.

کاتێك موسەنا لەبەغدادەوە بۆ ئەنبار گەڕایەوە، موزرایبی عەجلی لەگەڵ دەستەیەك بۆ کەباس نارد کەسەرکردەیی ئەوان لەدەست فارس عونابی تەغلەبیدا بو.

دواتر موسەنا پەیوەستی ئەوان بو و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت وکەباسی بینی کەپاشماوەکانیان لەگەڵ فارس عەناب لەوێ کۆچیان کردوە. موسوڵمانان شوێنی کەوتن و کاتێك ئەو لەکەباس دورکەوتبویەوە، گرتیان. پاشماوەی سوپاکەی ئەویان کوشتار کرد و کوشتارێکی فراوانیان کرد. کاتێك بۆ ئەنبار گەڕانەوە، ئەو فەرات کوڕی حەیانی تەغلەبی و عوتەیبە کوڕی نەهاسی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان هێرش بکەنە سەر هۆزەکانی تەغلەب لەصەفین. دواتر عەمرۆ کوڕی ئەبی سەلی هوجەیمی کردە

فەرمانڕەوایی خەڵك و بەدوای ئەو دوانەدا ڕۆیشت. کاتێك لەصەفین نزیك بونەوە، خەڵکانی ئەوێ هەڵاتن و لەفورات تێپەرین و ڕۆشتنە جەزیرە. لەم کاتەدا توێشوی موسەنا و هاورێکانی کۆتایی هات و لەبەر ئەمە لەناچاریدا، دەستیان بەخواردنی چوارپێکانی خۆیان (تەنانەت پێستەکەیان) کرد و تەنیا ئەوانەیان هێشتەوە کەچارەیان جگە لەهێشتنەوەیان نەبو. دواتر کاروانێکیان لەحەوران و دەبا گەمارۆدا و کەسەکانیان کوشتار کرد و سیان لەتەغلەبیەکان کەپاسەوانەکانی کاروانەکە بون، بەستیانەوە و دەستیان بەسەر کاروانەکەدا گرت. بەم سیانەی وت: ڕێگەم نیشان بدەن. یەکێك لەوان وتی: من و کەسەکان و سامانەکەم ئەمان ببەخشە تا ڕێگەی یەکێك لەهۆزەکانی تەغلەبت نیشان بدەم. موسەنا ئەمانی بەخشی. ئەو سەراسەری ڕۆژ لەگەڵ ئەوان ڕۆشت و شەو کاتێك چوارپێکان لەشوێنی ئاو خواردنەوە گەڕانەوە و خاوەنەکانیان لای ماڵەکانی خۆیان دانیشتبون، هێرشی کردە سەر ئەوان. شەڕکەرانی کوشت و ژن و منداڵەکانی دیل کرد و سامانەکانی کۆکردەوە و هەڵیگرت. تەغلەبیەکان، منداڵەکانی زی رەویحلە بون. ئەو کەسانەی لەرەبیعە لەناو سوپاکەی موسەنادا بون، بەشی خۆیان لەتاڵانیەکان بەخشی و ئەسیرەکانیان کڕیەوە و ئازادیان کرد. لەرۆژگاری جاهلی کاتێك عەرەبەکان ئەسیریان دەگرت، خەڵکی هۆزی رەبیعە لەم کارە خۆیان بەدور دەگرت.

هەواڵیان بەموسەنادا کەدەستەیەکی فراوان لەخەڵك کە لەو سەرزەمینە مابونەوە و لەوێ هاتوچۆ دەکەن، کەنارەکانی دیجلەیان کردۆتە لەوەڕگەی خۆیان. موسەنا هاتەدەر و نەعمان کوڕی عەوف و مەتەری شەیبانی کردە فەرماندەی دوباڵی سوپاکەی خۆی و حوزەیفە کوڕی مێحصەنی غیلفانی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی. ئەوان بەشوێنیاندا گەڕان و ئەوانیان لەتکریت گەمارۆدا و ئەوەی ویستیان لەمەڕوماڵات و چوارپێکان هەڵیان گرت و موسەنا بۆ ئەنبار گەڕایەوە. عوتەیبە کوڕی نەهاس و فەرات کوڕی حەیان و هاورێکانیان ڕۆشتن تا لەصەفین هێرشیان برد و لەوێ هۆزەکانی نەمر و تەغلەب پشت لەیەك ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەوان هێرشیان کردە سەر خەڵکی صەفین و تەنانەت دەستەیەك لەوانیان خستە ناو ئاو و هاواریان لێکردن: لەئاودا بخنێکێن، بخنێکێن. فەرات و عوتەیبە خەڵکیان هاندەدا و زیان بەرکەوتوانیان سەرکۆنە دەکرد و

دەیانوت: خستنە ناو ئاو بەتاوانی ئاگر تێبەردان! ئەم دوانە بەم کارە، رۆژێك لەرۆژگاری جاهلیان بیردەهێنایەوە کەئەوان لەدارستانێك لەدارستانەکانی عەرەب خەڵکانێك لەبەکر کوڕی وایلیان لەئاگردا سوتاند. دوای ئەوەی ئەوانیان خستە ناو ئاو و خنکاندیان، بۆ لای موسەنا گەڕانەوە. هەواڵی ئەم کارە بەگوێی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت. ئەو کەسی بۆ لای فەرات و عوتەیبە نارد و ئەم دوانەی بانگ کرد و سەبارەت بەوتارەکانیان پرسیاری لێ کردن. ئەو دوانە پێیان وت: ئەو کارەیان لەبەررق و کینە نەکردوە و ئەو قسەیان جگە وەك پەندێکی خۆیان نەهێناوەتە سەر زمان. عومەر ئەو دوانەی سوێند دا و فەرمانی پێدان بۆ لای موسەنا بگەڕێنەوە.

## هۆکاری شەڕی قادسیە

## پاشایەتی یەزدگێرد

کاتێك ئێرانیەکان هەلس و کەوتی موسوڵمانانیان لەگەڵ خەڵکی سواد بینی، بەرۆستەم و فیروزان فەرمانڕەواکانی ئێرانیان وت: وازتان لەناسازگاری خۆتان نەهێنا و ئێرانیەکانتان سوك و ریسوا کرد و دوژمنانتان تەماحکار. پاشایەتی ئێوە بەهێز نیە تا ئێوە لەسەر بیرورا و پاشایەتی بهێڵینەوە و ئێوە وڵات و تەختی پاشایەتی بەفیڕۆ بدەن. دوای بەغداد و سابات و تکریت جگە لەمەداین شارێك نیە. سوێند بەخوا یا بێ چەند و چون هاودەست دەبن یا بێ گومان لەئێوە دەست پێدەکەین و ئێوە لەناو دەبەین و خۆمان لەناو دەچین و لەم کاتەدا تۆڵەی خۆمان لەئێوە سەندۆتەوە. فیروزان و رۆستەم بەپوران کچی خوسرەویان وت: بۆ ئێمە ناوی ژنان و کەنیزەکانی خوسرەو و ژنان و کەنیزەکانی بنەماڵەی پاشایەتی بنوسە. ئەو کارەی کرد. ئەوان هەمویان کۆکردەوە و ژنانیان ئەشکەنجە کرد تا ناوی کوڕەکانی خوسرەو بڵێن. لای هیچ کام لەو ژنانە کوڕێکیان دەست نەکەوت. یەکێك لەو ژنانە وتی: جگە لەکوڕێك بەناو یەیزدگێرد لەمناڵەکانی شەهریار کوڕی خوسرەو لەدایکێك لەخەڵکی بادوریا کەس نەماوەتەوە. ئەوان پەیك و پەیامیان بۆ لای ئەو ژنە رەوانە کرد و داوای شازادەیان کرد. لەرۆژگاری شیری کەئەو هەمو ژنەکانی کۆکردەوە و هەمو کوڕەکانی کوشت، ئەم خاتونە ئەم شازادەی بۆ لای خاڵەکانی ناردبو. کاتێك سەبارەت بەو پرسیاریان لێکرد، ئەوانی بردە لای. ئەویان هێنا و لەبیست و یەك ساڵی لەسەر تەختی پاشایەتی دایاننا و فەرمانبرداری ئەو بون. ئێران ئارامی گرت و ئێرانیەکان دڵگەرم بون و سنوردارەکان لەبەرابەر ئەو سەری کوڕنوشیان دانەواند. ئەو بۆ هەمو پادگان وپێگە سنوریەکان سوپایەکی رەوانە کرد و سوپای حیرە و ئەنبار و ئۆبوڵەی دیاری کرد و رەوانەی کرد.

هەواڵی ئەم کارە بەموسوڵمانان و موسەنا گەیشت. ئەوان نامەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نوسی کەچاوەڕوانی چی لەخەڵکی سواد دەکەن.

نامە بەدەستی عومەر نەگەیشت تا خەڵکی سواد، چ ئەوانەی پەیمانیان بەستبو و چ

ئەوانەی پەیمانیان نەبەستبو، ناباوەڕ بون و لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە.
موسەنا هاتەدەر و ڕۆشت تا لەزیقار دابەزی و خەڵك لەناو یەك سوپا لە تف ئوردویان لێدا. کاتێك نامەی موسەنا بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت، وتی: نا، سوێند بەخوا بێ گومان پاشاکانی ئێران لەسەردەستی پاشاکانی عەرەب تێکدەشکێنین! ئەو هیچ ڕێبەر و گەورە و بیرمەند و بەهێز و سەروەر و بەتوانا و وتاردەرێکی نەهێشتەوە مەگەر ئەوەی بۆ شەڕ دژی ئێرانیەکان هانیدا. ئەو سەران و گەورەکانی خەڵکی بۆ شەڕ دژی ئێرانیەکان ئامادە کرد. عومەر بۆ موسەنا و هاورێکانی ئەو نامەی نوسی و فەرموی لەناو ئێرانیەکان وەرنەدەر و لەناوەکانی دەوروبەری ئێران بلاّو ببنەوە و لەناو موزێر و هۆزی ڕەبیعە و هاوپەیمانەکانی ئەوان، هیچ کەس لەبەهێزەکان و چوارپێکان و شەڕکەران و سوارەکان نەهێڵنەوە مەگەر ئەوەی خوازراو یا نەخوازراو ئەوان بۆ شەڕ ببەن. خەڵك لە خل و شەراف تا غوزی (کوێستانی بەصرە) دابەزین و لەسەلمان مانەوە. سەیری یەکیان دەکرد و هاوکاری یەکتریان دەکرد. ئەمە لەزی قەعدە ساڵی سیانزەیەمی کۆچی /ژانویەی ٦٣٤ زایینی رویدا. عومەر لەزی ئەلحەجەی ئەم ساڵە/فەوریەی ٦٣٥ نامەکەی خۆی بۆ کارگوزارەکانی لەعەرەب لەحەج رەوانە کرد و فەرمانیدا هیچ پیاوێکی بەهێز یا ئەسپ یا کەل و پەلی شەڕ یا بیرمەندێك نەهێڵنەوە مەگەر ئەوەی بۆ لای ئەوی رەوانە بکەن. ئەوانەی لەنیوەی ڕێگای مەدینە تا عێراق بون، لەکاتی گەڕانەوەی ئەو لەحەج هاتنە لای. ئەوانەی لەعێراق نزیکتر بون، پەیوەستی موسەنا کوڕی حارسە بون. هاورێیان و یارمەتی عەربەکان بۆ عومەر گەیشت.
لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. ئەو لەهەمو ساڵەکانی فەرمانڕەوایی خۆی لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.
کارگوزارانی عومەر لەم ساڵەدا ئەمانە بون: لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید بەوتەی هەندێ کەس، لەتایف عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص، لەیەمەن یەعلی کوڕی مونیە، لەعەمان و یەمامە خوزەیفە کوڕی مێحصەن، لەبەحرەین عەلا حەزرەمی، لەشام ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح، لەشاری کوفە یا سەرزەمینە دەست بەسەرداگیراوەکان موسەنا کوڕی حارسە و دامەزراوەی دادەوەریش لەژێر دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا بو.
لەم ساڵەدا ئەبو کەبشە کۆیلەی پێغەمبەر(ص) مرد. دەستەیەك دەڵێن دوای ئەوە مرد.

لەخەلافەتی ئەبوبەکر، سەهل کوڕی عەمرۆ برای سوهەیل مرد و ئەو لەموسوڵمانەکانی ڕۆژی گرتنی مەککە بو. لەخەلافەتی ئەو صەعب کوڕی جەسامەی لیشی مرد و لەدەسپێکی خەلافەتی ئەو کوڕەکەی عەبداللە کوڕی ئەبی بەکر چاوی لەدنیا بەست. ئەولەکاتی گەمارۆدانی تایف برینداربوو. دواتر برینەکەی، دوای چاکبونەوە، کێم و جەراحەتی کرد و لەئازارەکەی مرد. لەم ساڵەدا لەڕۆژی مردنی ئەبوبەکر، ئەرقەم کوڕی ئەبی ئەرقەم مرد. ئەو، هەمان کەس بو پێغەمبەر(ص) لەسەرەتایی پێغەمبەر(ص)ایەتی، لەماڵی ئەودا خۆی شاردەوە.

## روداوەکانی ساڵی چواردەیەمی کۆچی (٦٣٥ زایینی)

### دەسپێکی شەڕی قادسیە

کاتێك خەڵك لەدەوری عومەر کۆبونەوە، ئەو لەمەدینە ڕۆشتەدەر و لەسەر ناوێك بەناوی (صرار) دابەزی و ئوردوی لێدا. خەڵك نەیاندەزانی دەیەوێت چی بکات، ئا دەڕوات یا دەمێنێتەوە. هەرجار کەخەڵك دەیانویست شتێکی لێبپرسن، عوسمان یا عەبدولرەحمان کوڕی عەوفیان دەنارده لای. ئەگەر ئەم دوانە نەیانتوانیایە لەمەبەستەکەی ئەو ئاگادار ببنەوە، سێیەم کەس یانی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبیان دەنارده لای ئەو. عوسمان هۆکاری ڕۆشتنەکەی لێپرسی. ئەو خەڵکی کۆکردەوە و لەچۆنیەتی کارەکەی ئاگاداری کردنەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد ئایا بۆ عێراق بڕوات یانە. خەڵك تێکڕا وتیان: ڕێگەی عێراق بگرەبەر و ئێمە لەگەڵ خۆت ببە. بۆچونی ئەویش لەگەڵ خەڵك و وتی: ئەمشەو بکەنە بەیانی ومن لەگەڵ ئێوە دێم مەگەر ئەوەی بۆچون وبیروڕایەکی بەهێزتر و بیرمەندانەترمان بەرگوێ بکەوێت. دواتر گەورەکانی لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) کۆکردەوە و ناردی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەکردبویە جێگری خۆی لەمەدینە. عەلی هات. کەسێکی بەدوای تەڵحەدا نارد کەفەرماندەی پێشەنگەکان بو و ئەویش گەڕایەوە. زوبەیر و عەبدولرەحمانی بانگ کرد کەفەرماندەی دوباڵی راست و چەپی سوپاکەی بون و گەڕانەوە. دواتر لەگەڵ ئەوان بیروڕایان گۆڕیەوە و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) رەوانە بکات و سوپاکە لەگەڵ ئەودا بنێرێت. ئەگەر ئەوە بێت کەمەبەستیەتی، سەرکەوتنیان پێدەبڕێت و گەرنە ئەو پیاوە دەگەڕێنێتەوە و یەکێکی دیکە رەوانە بکات. لەم ڕێگەوەیە دەتوانرێت چۆك بەدوژمن دابنرێت.

عومەر خەڵکی کۆکردەوە و بەوانی وت دەمویست لەگەڵ ئێوەدا هاوڕێ بم تا ئەوەی زاناکان و بیرمەندان سنیان لەم کارە بەدور گرت. من بۆچونم وایە بمێنمەوە وپیاوێك رەوانە بکەم. کەسێك شیاو بۆ ئەم کارە قورسە بەمن بناسێنن.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاص لەم کاتەدا بۆ کاروباری پەیوەندیدار بەکۆکردنەوەی

خێرەکانی هوازین کۆکرابویەوە. عومەر نامەی بۆ نوسی کەبیرمەندان و بەهێزەکان و شەڕکەرەکان و هەڵگرانی کەرستەی شەڕ و ساز و بەرگە جەنگیەکان بۆ ئەو هەڵبژێرێت و رەوانەی بکات تا لەوان بۆ شەڕ دژی خەڵکی ئێران کەڵك وەربگرێت. نامەی سەعد بۆ عومەر گەیشت ( و ئەو سەرقاڵی راوێژ کردن لەگەڵ خەڵك بو تا چ کەسێك بۆ فەرماندەی شەڕ دژی ئێران هەڵبژێرێت. نامەکەی سەعد دەیوت: بۆ تۆ هەزار سوارکاری شەڕکەرم هەڵبژارد کەهەمویان بەهێز و بیرمەند و خاوەن خەڵکن وبەباشی پارێزگاری لەخەڵکەکەی خۆیان دەکەن و نەژاد و پیاوەتی و فرەزانی لەتایبەتمەندیەکانی ئەوانە. کاتێك نامەکەیان گەیشت، بەعومەریان وت: پیاوی دڵخوازی خۆتت دەستکەوت. وتی: ئەوپیاوە کێ بێت؟ وتیان: شێری ژیان سەعد کوڕی مالیك. عومەر گوێ لەوتەکانی ئەوان گرت و سەعدی بانگ کرد و فەرماندەیی سوپای شەڕکەری عێراقی پێبەخشی و پێشنیاری پێکرد و وتی: ئەم گومانە تۆ لەبەرابەر خوا فریو نەدات کەدەڵێن ئەو خاڵی پێغەمبەر(ص)ی خوا و هاوەڵی پێغەمبەر(ص)ی خوایە چونکە خوا خراپە بەخراپە ناسرێتەوە بەڵکو بەچاکە. لەنێوان خوا و هیچ کەسێك جگە لەفەرمانبردن پەیوەندیەك نیە و خەڵك لەپێشگای خوا وەك یەکن. خوا، خواوەندی ئەوان و ئەوان بەندەکانی ئەو کەلەرێگەی راستی پێش یەکتر دەکەون یا دوای یەك و ئەوەی لای ئەوە، تەنیا لەرێگەی فەرمانبرداریەوە بەدەستی دێنن. ئێستا بڕوانە پێغەمبەر(ص)ی خوا چ کارێکی بەپێویست دەزانی و ئەنجامی دەدا، تۆ ئەوت بینیوە، شوێن ئەو کەوە و بڕوا بەو بێنە و وەك ئەو کارەکانت ئەنجام بدە. عومەر پێشنیاری خۆڕاگری پێکرد و رەوانەی کرد و ئەو موسوڵمانانەی لای ئەو کۆببونەوە، لەگەڵ ئەودا ناردنی. ئەوان چوار هەزار کەس بون. ئەم کەسانە لەناویاندا بون: حومەیزە کوڕی نەعمان کوڕی حومەیزە لەبارق، عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب و ئەبو سەبرە کوڕی زوئەیب لەمەزجەح، یەزید کوڕی حارسی صودایی لەصودا و حەبیب و موسلیە و بیشر کوڕی عەبدالله هیلالی وەك فەرماندەی قەیس کوڕی عیلان.

عومەر ڕۆشتە لای ئەوان و لای دەستەیەك لەگەنجەکانی سەکون تێپەڕی کە لەگەڵ حەصین کوڕی نەمر و معاویە کوڕی حودەیج بون. ئەوان پیاوانێکی گەورە و باڵابەرز بون. عومەر پشتی لەوان کرد. پێیان وت: تۆ لەگەڵ ئەمان چیت بەسەر هات؟ وتی:

خەڵکانێك لەعەربەکان لای من تێنەپەریتن کەزیاتر لەمانە بەدوژمنیان بزانم.

دواتر ئەوانی رەوانە کرد. دواتریش بەبێزاریەوە ئاماژەی بەوان دەدا. یەکێك لەوان سودان کوڕی حومران بو کەعوسمانی کوشت. یەکیتریان عەبدولرەحمان کوڕی مولجەم کەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی کوشت. یەکیتریان معاویە کوڕی حودەیج کەدوای کوژرانی عوسمان شمشێری خستە ناو موسوڵمانان و وای نیشاندا بەدوای تۆڵەی خوێنی عوسمانەوەیە و یەکیتریان حوصیەن کوڕی ئەمیر بو کەخراپەترینی خەڵکان بۆ شەڕ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەقەڵەم دەدرا. دواتر عومەر ئامۆژگاری کردن و وپێشنیارە پێویستەکانی پێدان و رەوانەی کردن.. دوای رەوانە بونی سەعد، عومەر دو هەزار یەمانی و دوهەزار نەجدی بۆ هاوکاری ئەو ردوانە کرد. موسەنا کوڕی حارسە فەرماندەیی هەشت هەزار پیاوی شەڕکەری لەدەستدا بو. سەعد بەرێکەوت وموسەنا چاوەڕوانی هاتنی ئەوی دەکرد. موسەنا لەئازاری ئەو برینەی دوای چاکبونەوە دوبارە چڵکی کرد، چاوی لەدنیا بەست. پێش مردن، بەشیر کوڕی خەصایصەی کردە جێگری خۆی و سەعد کوڕی ئەبی وەقاص لەم کاتەدا لەزەروەد و هەشت هەزار پیاوی شەڕکەری لەگەڵدا بو. عومەر، فەرمانی بەبەنی ئەسەد دا لەناو سنوری سەرزەمینەکانی خۆیان لەنێوان دەشتی رێك و نارێکی (حەزن و بەسیتە) دابەزن. ئەوان بەسوپایەکی سێ هەزاری لەوێ نیشتەجێ بون. سەعد بەرەو شەراف بەرێکەوت و لەوێ دابەزی و ئەشعەس کوڕی قەیس لەگەڵ حەوتسەد پیاوی شەڕکەر لەخەڵکی یەمەن پەیوەستی بون. لەسەر ئەو بنەمایە، هەمو ئەو کەسانەی لەقادسیە ئامادە بون، سی و چەند هەزار پیاوی شەڕکەر بون و هەمو ئەو کەسانەی تالأنیەکان لەناو ئەواندا دابەش کرا، نزیکەی سی هەزار کەس.

لەناو شەڕکەران کەس لەرەبیعە بۆ شەڕ دژی ئێرانینەکان بوێرتر و ئازاتر نەبو. موسوڵمانان ئەویان بەرەبیعەی (شێر کوژ) یا (رەبیعەی سەمەند سوار) ناو دەبرد. عومەر هیچ کام لەگەورەکان، بیرمەندەکان، وتاردەرەکان یا ناودارەکانی لەخەڵکان نەهێشتەوە مەگەر ئەوەی بۆ لای سەعدی رەوانە کردن. سەعد هەمو ئەو کەسانەی لەئەرتەشی موسەنا لەعێراق مابونەوە، کۆکردەوە. ئەوان لەشەراف کۆبونەوە. ئەوانی ساماندا و فەرماندەکانی دیاری کرد و بۆ هەر دەکەسێك سەردستەیەکی دیاری کرد و

ئاڵاکانی لەسەر دەستی ئەو کەسانە هەڵکرد کەپێشینەی جوامێری وپیاوەتیان بو. لەسەر دەستە شەڕکەرەکان و لەسەر کۆتایی سوپاکە و پێشەنگەکان و پیادەکان و پێشڕەوەکان و باڵەکانی چەپ و ڕاست فەرماندەی دیاری کرد. بەبێ ئاگاداری عومەر کەسی لەسەر کار لانەبرد. فەرماندەیی پێشەنگەکانی بەزوهرە کوڕی عەبداللە کوڕی حەویە سپارد کەرەوانەی عوزەیب بو. ئەو لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص)ی خوا بو. لەسەر باڵی ڕاست عەبداللە کوڕی موتعەمی کردە فەرماندە کەئەویش لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بو. لەسەر باڵی چەپ شورەحبیل کوڕی سەمتی کەندی کردە فەرماندە. خالید کوڕی عورفۆتەی هاوپەیمانی شەمسی کردە جێگری خۆی. لەسەر دواوەی سوپاکەی عاصم کوڕی عەمرۆ تەمیمی کردە فەرماندە. لەسەر پێشەنگەکان سواد کوڕی مالیکی تەمیمی، فەرماندەیی سوارەکانی بەخشی بە سەلمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی، فەرماندەی پیادەکان حەمال کوڕی مالکی ئەسەدی و سوارەکان عەبداللە کوڕی زی سەهمەینی حەنەفی. عومەر کاری دادپەروەری بەعەبدولرەحمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی سپارد و هەروەها بەش کردنی تالآنیەکانیش. پێشەنگی ئەوانی خستە ئەستۆی سەلمانی فارسی و کاروباری دەبیری بەزیاد کوڕی ئوبیە سپارد.

لەم کاتەدا مەعنی کوڕی حارسی شەیبانی هاورێ لەگەڵ سەلما کچی خەصەفە، ژنی موسەنا هاتنە شەراف. مەعنی دوای مردنی براکەی موسەنا ڕۆشتبوە لای قابوس کوڕی قابوس کوڕی مونزەر لەقادسیە. ئێرانیەکان قابوسیان ڕەوانە کردبو تا عەرەبەکان بۆ شەڕ دژی سوپای ئیسلام هانبدات. مەعنی ڕۆشتبوە لای و ئەو هاورێکانی بەشێوەیەکی لەناکاو کوشتبو. دوای ئەوە بو هاتە زی قار و ڕۆشتە لای سەعد و ئەندێشەی موسەنای بۆ ئەو و موسڵمانەکان باس کرد کەوتبوی لەگەڵ ئێرانیەکان لەسنورەکانیان لەخوارەوەی (حەجەر) لەسەرزەمینی عەرەب شەڕ بکەن و لەقوڵایی سەرزەمینی ئەوان (ئێرانیەکان) شەڕیان لەگەڵ نەکەن. ئەگەر خواوەند موسوڵمانان سەرکەوتو بکات، شوێنێکی بەربلآوتر لەگۆڕپانی شەڕیان پێدەبرێت و ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت، دەگەڕێنەوە لای هێزە پشتیوانەکانی خۆیان و لەم کاتەدا لەرێگەی خۆیان ئاگادارتر و بوێرتر لەسەرزەمینەکانی خۆیان دەمێننەوە تا خواوەند بارودۆخ بۆ بەرژەوەندی ئەوان بگۆڕێت. سەعد و هاورێکانی لەخوا بۆ موسەنا پاڕانەوە و داوای لێخۆشبونیان بۆ کرد.

سەعد مەعنی بۆ کارەکەی راسپارد وپێشنیاری کرد لەگەڵ کەسەکانی بەشێوەیەکی جوان هەڵس و کەوت بکرێت. دواتر سەعد لەگەڵ سەلما هاوسەری موسەنا پەیوەندی هاوسەری بەست. هاورێ لەگەڵ سەعد نەوەد و نۆ کەس لەبەدریەکان، سێسەد و سیانزە کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) لەبەیعەتی رضوان بەدواوە، سێسەد کەس لەبینەرانی گرتنی مەککە و حەوتسەد کەس لەمناڵی هاورێکانی پێغەمبەر(ص) بون.

بۆ سەعد نامەیەك لەعومەرەوە هات کەنەندێشەکەی موسەنای پشت راست دەکردەوە. هەروەها عومەر بۆ ئەبوعوبەیدەی نوسی کەعێراقیەکان و هەر کەسێك خوازیاری پەیوەست بون بەئەرتەشی شەرکەر لەعێراقە، بۆ عێراق بنێرێت. پادگانێکی ئێرانیەکان لەکۆشکی کوڕی موقاتیل بو کەنەعمان کوڕی قەبیصەی تایی (کوڕی مامی قەبیصە کوڕی ئەیاس فەرمانرەوایی حیرە) فەرمانرەوایەتی دەکرد. کاتێك نەعمان کوڕی قەبیصە لەهاتنی سەعد ئاگادار بویەوە، پرسیاری ئەوی کرد و عەبداللە کوڕی سینان کوڕی خوزەیم ئەسەدی لای ئەو بو. پێیان وت: پیاوێك لەقورەیش. نەعمان وتی: سوێند بەخوا بێ گومان شەڕی ئەو دەکەم چونکە قورەیشیەکان کۆیلەی ئەو کەسەن کەسەرکەوێت. سوێند بەخوا لەسەرزەمینەکەی خۆیان بەدو جوت پێڵاو دێنەدەر. عەبداللە کوڕی سینان لەوتەکەی تورە و مۆڵەتی دا تا گەڕایەوە بۆ خێوەتەکەی خۆی. دواتر ئەوی کوشت و پەیوەستی سەعد بو و باوەڕی بەئیسلام هێنا.

سەعد لەشەراف بەرێکەوت و لەعوزەیب نیشتەجێ بو. دواتر بەرێکەوت تا لەقادسیە لەنێوان عەتیق تا خەندەق، روبەروی قەنتەرە، ئوردوی لێدا و قودەیس یەك میل لەخوارەوەی ئەو شوێنەبو. عومەر بۆ سەعدی نوسی: ئەمە بیرۆکەی منە و بەمشێوەیە پێشبینیم کردوە کاتێك روبەروی دوژمن دەبنەوە، ئەوان تێکدەشکێنن. هەرجار و بەهەر شێوەیەك، یەکێك لەئێوە گەمە لەگەڵ یەکێك لەئێرانیەکان بکات و بەئەمان یا بەئیشارە کردن یا زمان، دڵنەوایی بکات، بۆ ئەو هاوشێوەی ئەماندانە و ئێوە پێویستە رێز لەئەمان و پەیمانەکەی خۆتان بگرن چونکە هەڵە لەئەمەکداری لەئەستۆی ئەمەکداردایە و شکاندنی پەیمان هۆکاری لەناوچون و ئەمەیش هۆکاری سستی و لاوازی ئێوە و بەهێزی دوژمنەکانتانە. کاتێك زوهرە کوڕی عەبداللە کوڕی قتادە لەگەڵ پێشەنگەکان دابەزی و شەو داهات، دەستەیەکی پێکهاتو لەسی پیاوی شەڕکەر و جوامێر

و باڵابەرزی رەوانە کرد و وتی هێرش بکەنە سەر حیرە و تاڵانی بکەن. کاتێك ئەوان لەسیلحین تێپەرین، دەنگی گفتوگۆیەکیان بیست، چاوەڕێیان کرد تا روبەرویان بونەوە: خوشکی ئازادمەرد کوڕی ئازادبە سنورداری حیرە بو کە لەشەوی بوکێنی بۆ لای فەرمانڕەوایی صینەین دەبرا. ئەو یەکێك لەگەورەکانی ئێران بو. بوکەیر کوڕی عەبداللەی لەیسی فەرماندەی ئەم دەستە شەڕکەرە هێرشی کردە سەر شیرزاد کوڕی ئازادبە و کەمەری شکاند. ئەسپەکان ڕەمیان کرد و هەڵاتن و سوپای ئیسلام هەمو بارەکانیان هاوڕێ لەگەڵ کچەکەی ئازادبە و سی پیاو لەدێدارەکان و سەد پیاوی دیکە گرت. ئەوان سامانێکی زۆریان پێبو کەبەهاکەی نەدەزانرا. بوکەیر هەمویانی پێشخست و گەڕایەوە و لەکاتی بەرەبەیان خۆی گەیاندە عوزەیب و ئەلهێجانات لای سەعد. سەعد ئەوانی بەسەر موسوڵمانەکاندا دابەش کرد و چەندین سواری بۆ پاسەوانی کردنی ئەوان لەعوزەیب بەجێهێشت و فەرماندەیی ئەوانی بەغالیب کوڕی عەبداللەی لەیسی بەخشی. سەعد یەك مانگ لەقادسیە مایەوە و لەم ماوەدا کەس لەئێرانیەکان نەهاتنە لای ئەو. ئەو عاصم کوڕی عەمری ناردە میشان تا لێکۆڵینەوە لەسەر مەڕ و مانگاکانی ئەو ناوچەیە بکات کەنەیتوانی کارەکەی ئەنجام بدات و خەڵکی ئەو ناوچەیە لەناو ماڵەکانی خۆیان خۆیان حەشاردا. ئەو پیاوێکی لای دارستانەکە بینی وسەبارەت بەمەڕ و مانگاکان پرسیاری لێکرد. وتی: نازانم. لەم کاتەدا مانگایەك لەناو دارستانەکەوە بۆڕاندی کە: ئێمە لێرەین، ئەم دوژمنی خوایە درۆ دەکات! ئەو رۆشتە ناو دارستانەکە و گاکانی بۆ پێشەوە لێخوری وبردیە ناو سوپای ئیسلام کەسەعد ئەوانی بەسەر خەڵکدا دابەش کرد و توانیان بۆ ماوەیەك ژیان بەخۆشی و زۆر خۆری بەرنەسەر. ئەم هەواڵە لەرۆژگاری حەجاج کوڕی یوسف بەو گەیشت و پەیك و پەیامی بۆ لای چەندین کەس نارد و پرسیاری لێکردن. ئەوان وتیان: ئەویان بینیوە و بیستویانە. حەجاج وتی: درۆ دەکەن. وتیان: ئەم وتەی تۆ کاتێك راستە کە تۆ شایەتی ئەو روداوە بوبێتی و ئێمە نا. حەجاج وتی: راست دەکەن. خەڵك لەوبارەوە چیان دەوت؟ وتیان: ئەومیان بەنیشانەیەك دەزانی کەیانی خواوەند لەئێمە رازیە و ئێمە بەسەر دوژمنەکانمان سەرکەوتو دەکات. حەجاج وتی: ئەمە نابێت مەگەر ئەوەی هەمو سوپاکە خۆپارێز و چاکەکار بن. وتیان: ئێمە نازانین چی لەدڵی ئەواندا شاراوەیە، بەڵام ئەوەی بینیمان، هیچ کات کەسانێکمان

نەبینی زیاتر لەوان پشت لەدنیا بکات و دوژمنی خواستەکانی ئەم جیهانە بێت.
نە لەناو ئەوان کەسێکی ریسوا هەبو، نە لاواز و نە ئەو کەسانی کاری شەرمێنەر ئەنجام دەدەن. ئەم شەڕەیان بە ئەباقیر (گاگان) ناوبرد.
سەعد سوپایەکی بۆ تالآن و تالآن کردن بۆ پانتاییەکانی نێوان کەسکەر و ئەنبار رەوانە کرد. ئەوان بەئەندازەیەك خۆراکیان هێنایەوە کە بۆ رۆژگارێك بەسیان بو. لەنێوان هاتنی خالید کوڕی وەلید لەعێراق و دابەزینی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس لەقادسیە، دو ساڵ و ماوەیەکی خایاند. مانەوەی سەعد وەقاس لەقادسیە دو مانگ و چەند رۆژ بو تا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.
دواتر خەڵکی سواد داوای هاوکاریان لەیەزدگێرد کرد و ئاگاداریان کردەوە کەعەربەکان لەقادسیە دابەزیون و لەبەرابەر کارەکەی ئەوان، هیچ هەوڵێکی ئەوتۆ نەدراوە. ئەوان لەنێوان شوێنی مانەوەی خۆیان تا فوراتیان وێران کرد و چوارپێکان و مەڕوماڵآتیان تالآن کرد. ئەگەر هاوکاری بەئێمە نەگات، بەدەستی خۆمان ولآتیان تەسلیم دەکەین. هەروەها ئەو کەسانەی باخ و بێستان و کێڵگە و زەوی و سامانیان لە (تف) هەبو، نامەیەکی لەم چەشنەیان بۆ نوسی و ئەویان بۆ ناردنی سوپا هاندا. یەزدگێرد کەسی بۆ لای رۆستەم نارد کەهاتە لای و شای شاکان پێی وت: من باوەڕم وایە تۆ بۆ ئەو ناوچانە رەوانە بکەم چونکە سوارکارێکی بەئەزمونی و دەزانی ئەمڕۆ ئێران و ئێرانیەکان چیان بەسەر هاتوە و هیچ ئازار و دەردێکی هاوشێوەیان پێنەبڕاوە. رۆستەم فەرمانبرداری کرد و رازی بو، بەڵام دواتر وتی: با من بمێنمەوە و یەکێتر ردوانە بکە چونکە عەرەبەکان (تا ئەو کاتەی منت رەوانە نەکردوە) لەئێرانیەکان دەترسن. لەلایەکی دیکە، ئەگەری هەیە بەبونی من و نەڕۆشتنی من بۆ شەڕ تاج و تەختی پاشایەتی پایەدار بێت. ئەمە دەکرێت ئەگەر خواوەندی پاك ئەم بارە قورسە لەسەر شانی ئێمە هەڵگرێت و ئەوەمان بەسە داوێکیان بۆ بنێینەوە. لەشەڕ، فرمزانی باشترە لەسەرکەوتنی کەم و درەنگ کردن باشترە لەخێرایی. شەڕکردن لەگەڵ چەندین سوپا کەیەك لەدوای یەك رودەدات، بۆ دوژمنی ئێمە قورستر و لەتێکشکانی تەواوەتی باشترە. شای شاکان گوێ لەقسەکانی رۆستەم نەگرت و رۆستەم وتەکانی خۆی دوبارە کردەوە و وتی: بەفیرۆدانی بۆچونەکەم، منی ناچار کرد خۆم گەورە بکەم و بەگەورە نیشان بدەم و پاك و خاوێن

بکەمەوە. ئەگەر چارەم بەناچار نەدەبینی، قسەم نەدەکرد.٠سوێندت دەدەم بەخوا گیان و تاج و تەختی خۆت بپارێزە و رێگە بدە من لەناو سوپاکەی خۆم بمێنمەوە و جالینوس رەوانە بکەم. ئەگەر شەڕ لەبەرژەوەندی ئێمە بێت باشتر وگەرنە، یەکی دیکە رەوانە دەکەین تا سەرئەنجام ئەگەر چارەمان نەما، لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری دەکەین و ئەوان بەبەهێزی خۆمان لاواز دەکەین. من تا ئەو کاتەی شکەستم نەخواردوە، هیوام بەخەڵکی ئێران هەیە. پاشا پێداگری کرد کەرۆستەم رەوانە بێت. ئەو رۆشت و لەساباب ئوردوی لێدا و کەسی بۆ لای شا نارد تا لەو خۆش بێت، بەڵام شا گوێی لەوتەکانی ئەو نەگرت.

هەواڵی ئەم کارە بەسەعد گەیشت. ئەو نامەی بۆ عومەر نوسی. عومەر بۆی نوسی: ئەوەی لەوان بەتۆ دەگات، هیچ کات نابێت تۆ خەمبار وبێ هیوا بکات. داوای هاوکاری لەخوا بکە و کاری خۆت بەو بسپێرە و چەندین پیاوی بەتوانا لەقسە کردن و بیرمەند و چالاك بۆ لای پاشای ئێران رەوانە بکە وپێشنیاری ئیسلامی پێبکە چونکە ئەم بانگێشت کردنەی تۆ دەبێتە هۆی لاوزای ئەوان.

لەم کاتەدا سەعد چەند کەسێکی بۆ لای یەزدگێرد نارد، لەناو ئەوان، نەعمان کوڕی موقەرن، بسر کوڕی ئەبی رۆهم، حەمەلە کوڕی حەویە، حەنزەلە کوڕی رەبیع، فەرات کوڕی حەیان، عودەی کوڕی سوهەیل، عوتارد کوڕی حاجب، موغەیرە کوڕی زورارە کوڕی ئەباشی ئەسەدی، ئەشعەس کوڕی قەیس، حارس کوڕی حسان، عاصم کوڕی عەمرۆ، عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب، موغەیرە کوڕی شەعب و مەعنی کوڕی حارسە. ئەوان لەناو سوپا هاتنەدەر و رۆشتنە لای یەزدگێرد و لای رۆستەم تێپەڕیتن و داوای فەرمانیان لەیەزدگێرد کرد تا بڕۆنە لای. یەزدگێرد وەزیرەکانی خۆی و رۆستەمی بانگ کرد و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد تا چی بەموسوڵمانەکان بڵێت و چیان لەگەڵدا بکات.

خەڵك کۆبونەوە و سەیری ئەوانیان دەکرد و لەژێر رانەکانی ئەوان ئەسپانێك بون بەردەوام دەیانحیلاند و پیاوەکان قامچیان لەدەستا بو. یەزدگێرد فەرمانی بەوان دا و وەرگێری بانگ کرد وپێی وت: لەوان بپرسە کە: چ هۆکارێك ئەوانی گەیاندۆتە ئێرە و لەبەر چی ئاهەنگی ولاتەکەی ئێمەیان کردوە؟ ئایا لەبەر ئەوەی ئێمە ئێوەمان پشت

گوێ خست و سەرقاڵی کاروبارەکانی دیکە بوین، بەم شێوەیە چاونەترس بون؟
نەعمان کوڕی موقەرن بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەگەر بتانەوێت بەنوێنەرایەتی ئێوە قسە دەکەم و ئەگەر کەسێکی دیکە بیەوێت، با ئەو قسە بکات. وتیان: تۆ قسە بکە. نەعمان وتی: خواوەند خۆشەویستی خۆی بەسەر ئێمەدا باراند و پێغەمبەر(ص)ێکی بۆ ناردین بۆ ئەوەی فەرمانی چاکەمان پێ بدات و لەخراپە بمانگێڕێتەوە. مژدەی بەئێمە بەخشی ئەگەر وەڵامی داواکەی ئەو بدەینەوە، باشی ئەم دنیا و ئەودنیامان پێدەبەخشێت. داوای لەهیچ هۆزێك نەکرد مەگەر ئەوەی هەندێ کەس وەڵامیان دایەوە و دەستەیەك خۆیان لێ بەدور گرت.
دواتر خوا فەرمانی پێدا پەیکی و پەیامی خۆی بۆ لای ئەو کەسانەی باوەڕیان نەهێناوە، بنێرێت. ئەو، ئەم کارەی بەوان دەسپێکرد و ئەوان بەدو شێوە روبەروی بونەوە: کەسانێك بەزۆر کە بەروگەشی هەڵس و کەوتی لەگەڵدا کردن و ئەو کەسانەی بەرەزامەندی کەچاکەی باشتریان بەرکەوت. ئێمە هەمومان هەستمان بەوە کرد، ئەوەی بۆ ئێمەی هێناوە، لەودوژمنایەتی و کورتبینیەی گرفتارین پێی، باشترە. دواتر پێی وتین لەنەتەوەکانی دەوروبەری خۆمان دەست پێبکەین و ئەوان بۆ دادپەروەری بانگێشت بکەین. ئێستا ئێمە ئێوە بۆ سەر ئایینەکەی خۆمان بانگ دەکەین و ئەمە هەمان ئایینە رێزی لەچاکە کرد و خراپەی بەخراپە لەقەڵەمدا. ئەگەر لەرازی بون بەم پێشنیارە خۆتان بەدور بگرن، خراپەیەکی دیکە بەئێوە پێشنیار دەکرێت کە لەخراپەیەکی تری خراپتر لەو، باشتر دەبێت و ئەویش باجە. ئەگەر بەمەیش رازی نەبن، شەڕتان لەگەڵ دەکەین. ئەگەر باوەڕ بەئایینەکەی ئێمە بێنن، نوسراوی خوا لای ئێوە بەجێ دێڵین و ئێوە ناچار دەکەین فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن. ئەوسا لای ئێوە دەڕۆین و وڵاتەکەتان بەخۆتان بسپێرین. ئەگەر باج بدەن، لێتان وەردەگرین و لەبەرابەر کەسانی دیکە پارێزگاریتان لێدەکەین و گەرنە ئاڵای شەڕ لەبەرابەر ئێوە هەڵدەکەین.
یەزدگێرد دەستی بەقسە کرد و وتی: من لەسەر زەوی خەڵکانێکی بەدبەخت تر و پەست تر و نەزانتر و دوژمن تر بەخۆم، لەئێوە زیاتر ناناسم. ئێمە دێهاتەکانی دەوروبەری خۆمان دەکردە فەرمانڕەوایی ئێوە و کاروباری ئێوەیان دەگرتە دەست و

قورسایی کارەکانی ئێومیان لەسەر شانی ئێمە هەڵدەگرت. چاوی تەماح مەبڕنە هاتنە ناو ئێران. ئەگەر سەبارەت بەئێوە کەمتەرخەمی کراوە، ئەم کارە ئێوە لەبەرابەر ئێمە فریو نەدات و ئەگەر ئێستا کەوتونەتە تەنگانەوە، خواردنتان پێدەبەخشین تا کاتی سەوز بونی و پێگەیشتنی دانەوێڵە بۆ ژیانتان بەس بێت. ڕێزتان لێدەگرین و جل و بەرگتان پێ دەدەین و کەسێك دەکەین بەپاشای ئێوە کەبەباشی هەڵس و کەوتتان لەگەڵدا بکات.

خەڵك بێدەنگ بون. موغەیرە کوڕی زورارە هەستا و وتی: ئەی پاشا، ئەمانە گەورە و سەروەری عەرەبەکانن. ئەوان گەورەن و شەرم لەگەورەکان دەکەن. چونکە گەورەکان، گەورەکان بەرێزدار و گەورە دەزانن. ئەوان هەمو پەیامەکەی خۆیان باس نەکرد. هەروەها بۆ هەمو قسەکانی تۆ وەڵامیان پێیە. لەگەڵ من قسە بکە تا من ئەو کەسە بم پەیامەکە بەتۆ بگەیێنم و ئەوان شایەتی بدەن. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەخراپی ڕۆژگاری ئێمە باست کرد، ڕاستە و ئێمە لەوەیش خراپتر بوین. دواتر خراپی ڕۆژگار و هاتنی پێغەمبەر(ص) بۆ لای ئەوان، بەهەمان شێوەی نەعمان ئاماژەی پێدا، باسی کرد و ئاماژەی بەوەدا کەپێغەمبەر(ص) ئەم پەیامەی بۆ ئێمە جێهێشتوە کە لەگەڵ شەڕکەران شەڕبکەین تا یا بەئایینەکەی ئێمە ڕازی دەبن یا باج دەدەن. دواتر پێی وت: ئەگەر دەتەوێت، بەر یسوایی باج بدە و ئەگەر ناتەوێت، ئامادەی شمشێربە یا باوەڕ بێنە کەخۆت بەتەنیایی ڕزگارت دەبێت.

یەزدگێرد وتی: ئەگەر ڕێگەیان دەدا کەنێردراوان بکوژن، ئێوەم دەکوشت. ئێوە لای من هیچتان نیە. دواتر فەرموی بارێکی قورسیان لەخاك هێنا. دواتر فەرموی ئەم بارە لەسەر گەورەترین و دیارترینی ئەم خەڵکە بار بکەن و ڕایکێشن تا لەدەروازەی مەداین دەرواتەدەر. بۆ لای خواوەندەکانی خۆتان بگەڕێنەوە و ئاگاداری بکەنەوە کە ڕۆستەم ڕەوانە دەکەم تا ئەو لەگەڵ ئێوە لەچاڵی قادسیە بەخاك بسپێرێت. دواتر ڕەوانەی وڵاتەکەی ئێوەی دەکەم تا بەشێوەیەکی خراپتر لەشاپور ئێوە سەرقاڵی خۆتان بکات.

عاصم کوڕی عەمرۆ هەستا تا خاکەکە هەڵگرێت. وتی: من دیارترینی ئەوانم، من سەروەری ئەوانم. ئەو بارەکەی خستە سەر شان و ڕوی لەوشترەکەی خۆی کرد و سواری بو، خاکەکەی هەڵگرت و بردیە لای سەعد و وتی: مزگێنی بێت کەخواوەند کلیلی

ولاتەکەی ئەوانی بەئێمە بەخشی (لەبەر ئەوەی خۆیان خاکی ولاتەکەیان بەئێمەدا).

هاونشینەکانی پاشا ئەم کارەیان پێ ناخۆش بو. پاشا بەرۆستەم کە لەساباتەوە هاتبو، وتی: گومانم نەدەکرد کەسانی وا لەناو عەرەبەکاندا هەبن. ئێوە وەلامێکی باشترتان لەم خەلکە نەدایەوە. ئەم خەلکانە بەراستی قسەیان لەگەل من کرد. ئەوان مژدەی کارێکیان دا کەبێ گومان پێی دەگەن یا بێ چەند و چون لەو رێگادا گیان دەبەخشن. زاناترینی ئەوانم بەنەزانترینیان بینی چونکە خاکەکەی خستە سەر شانی خۆی. رۆستەم وتی: ئەی شای شاکان، ئەو فرمزانترینی ئەوان بو. ئەو بینی عاصم کوری عەمرۆ چی کرد و هاورێکانی نەیانبینی. ئەو لێکدانەوەیەکی خراپی بۆ ئەم کارە کرد. رۆستەم خەمبار و تورە لای پاشا هاتەدەر و چەندین کەسی بەدوای دەستەی نوێنەرایەتی موسولمانان رەوانە کرد و بەهاورێ بڕواپێکراوەکانی خۆی وت: ئەگەر ئەم کەسانە دەستەی نوێنەرایەتی عەرەب بدۆزنەوە و خاکەکەیان لێوەربگرنەوە، ولاتەکەی خۆمان رزگار کردوە و ئەگەر ئەم کارە نەکەن، خواوەند ئەم سەرزەمینەتان لەدەست دەردێنێت. نێردراوان لەحیرە گەڕانەوە و وتیان: عەرەبەکانمان نەدۆزیەوە. رۆستەم وتی: بێ گومان ئەم خەلکە دەست بەسەر خاکەکەی ئێوەدا دەگرن. ئەو نەستێرەناسێکی دین پیشەبو.

دوای رۆشتنی دەستەی نوێنەرایەتی لای یەزدگێرد، سواد کوری مالکی تەمیمی هێرشی کردە سەر نیجاف و فیراز و سێسەد چوارپێی لەئێستر و کەر و مانگا پێش خۆی خست و لەماسی باری کردن ولەکاتی بەرەبەیان هاتە ناو سوپا. سەعد لەناو خەلکەکەدا دابەشی کرد و ئەو رۆژەیان بەرۆژی ماسیەکان ناوبرد. ئەم هێرشانە بۆ بەدەست هێنانی خواردن ئەنجام دەدران و لەبەر ئەمە شەڕەکانیان بەناوی ئەوانەوە ناو دەبرد، رۆژی گاکان و رۆژی ماسیەکان. سەعد جارێکی دیکەیش هێرشێکی رێکخست و هەلیان کوتایە سەروشترەکانی بەنی تەغلەب و نەمر و ئەوانیان لەگەل خاوەنەکانیان گرت. سەعد وشترەکانی سەربری و گۆشتەکەی لەناو خەلکەکەیدا دابەش کرد و خواردنێکی زۆریان دەست کەوت. عەمرۆ کوری حارسیش هێرشی کردە سەر نەهرەین و مەڕومالاتی زۆری گرت و گەڕایەوە.

رۆستەم لەساباتەوە رەوانە بو و ساز وبەرگ و کەل و پەلی شەڕی کۆکردەوە و

پێشەنگەکانی خۆی (پێکهاتو لەچل هەزار پیاوی شەڕکەر)ی بەفەرماندەیی جالینوس ڕەوانە کرد و خۆی لەگەڵ شەست هەزار پیاوی شەڕکەر بەرێکەوت. کۆتایی سوپاکەی بیست هەزار شەڕکەر بو. ئەو لەسەر باڵی ڕاستی سوپاکەی خۆی هورموزانی دانا و لەسەر باڵی چەپ مێهران کوڕی بەهرامی ڕازی. ڕۆستەم بۆ دڵخۆش کردنی پاشا وتی: هیوادارم خوا ئێمە بەسەر ئەم خەڵکەدا سەرکەوتو بکات تا هێرش بکەینە ناو سەرزەمینەکەی ئەوان و لەناو وڵات و سەرزەمینەکەی خۆیان گرفتاریان بکەین تا سەرئەنجام بەئاشتی ڕازی ببن.

ڕۆستەم لەمەداینەوە بەشەست هەزار شەڕکەر هاتەدەر و لەساباتەوە بە سەد و بیست هەزار شەڕکەر ڕۆشتەدەر. جگە لەم ئامارە ئاماژەیان بەژمارەی دیکەیش داوە.

کاتێك ڕۆستەم لە ساباتەوە ڕۆشت بۆ هامون، بۆ براکەی خۆی بەندوانی نوسی: بەڵام دواتر، قەڵاکانی خۆتان نوژەن بکەنەوە و پیاوە شەڕکەرەکان ئامادە بکەن چونکە گومان دەکرێت عەرەبەکان ئێوە لەسەرزەمینەکەی خۆتان و لەناو ماڵ و منداڵی خۆتان دەرپەڕێنن. باوەڕم وایە، ئەوان سەرقاڵ بکەن یا ماتڵیان بکەن تا ئەو کاتەی ئەستێرەی سەرکەوتنی ئەوان بەرەو بەدبەختی دەڕوات چونکە ماسی ئاوی قوڕاوی کردوە، وشتر مرەکان باش بون، ناهید باش بۆتەوە و شایەن ڕوی کردۆتە ناوەڕاست و بەهرام ڕۆشتوە و لەئەستێرەی ئەم خەڵکە جگە لەوە نابینم کە بەسەر ئێمەدا زاڵ دەبن و دەست بەسەر سەرزەمینەکانی دەوروبەردا دەگرن. دژوارترین شت کەبینیم، ئەوە بو پاشا وتی: دەبێت بڕۆیت و گەرنە خۆم بۆ شەڕی عەرەبەکان دەڕۆم.

جابان لەقەنتەرە چاوی بەرۆستەم کەوت. هەردوکیان ئەستێرەناس بون. جابان دەستی بەدەردەدڵ کرد و وتی: ئایا ئەوەی من دەیبینم، نایبینی؟ ڕۆستەم پێی وت: من بە ((خشاش))( ئەو دارەی دەیکەنە لوتی وشتر و جڵەوی پێدەبەستن و بەم شێوەیە بەدوای خۆیاندا رایدەکێشن) و هیچ چارەیەك لەفەرمانبردن نابینم. دواتر بەرێکەوت و لەکوسی دابەزی. پیاوێکیان لەعەرەبەکان هێنایە لای و لێی پرسی: چ هۆکارێك ئێوەی لێرەدا کۆکردۆتەوە و بەدوای چیەوەن؟ وتی: هاتوین تا مژدەی خوا سەبارەت بەگرتنی سەرزەمین و بنەماڵەی ئێوە بێتەدی و ئەمە لەکاتێکدا رودەدات لەباوەڕهێنان خۆتان بەدور بگرن. ڕۆستەم وتی: ئەگەر پێشتر بکوژرێن! پیاوی عەرەب وتی: هەرکەس لەئێمە

بکوژرێت، یەکراست بۆ بەهەشت دەڕوات و هەرکەس زیندو بمێنێت، مژدەکەی خوا دەبینێت چونکە هیچ گومانێك لەمژدەی خوادا نیە.

رۆستەم وتی: بەم شێوەیە، خوا ئێمەی بەدەستی ئێوە سپاردوە! پیاوی عەرەب وتی: کارەکانتان ئەم بارودۆخەی بەسەر ئێوەدا سەپاندوە و لەم رێگاوەیە خوا ئێوەی بەدەستی دوژمنان سپاردوە. ئاگادار بە دەوروبەر فریوت نەدەن چونکە تۆ شەڕی خەڵکان ناکەیت، بەڵکو لەگەڵ چارەنوسی خواییدا شەڕدەکەیت. رۆستەم ئەوی کوشت و بەرێکەوت تا لەبێرس دابەزی. شەرکەرەکانی زۆریان لەخەڵك کرد و منداڵ و سامانی خەڵکیان بەزۆر و ناڕەوا وەرگرت و بەزۆر تێکەڵ بەژنان بون و دەستیان بەخواردنەوە کرد. خەڵك لای رۆستەم گلەییان کرد و ئەو وتی: ئەی خەڵکی ئێران، سوێند بەخوا ئەو پیاوە عەرەبە راستی دەکرد، بەخوا تەنیا کارەکانمانە ئێمە بەدەستی دوژمن دەسپێرێت. سوێند بەخوا عەرەبەکان هەرچەند شەڕی ئەم خەڵکە دەکەن بەڵام باشتر لەئێوە لەگەڵ ئەم خەڵکە هەڵس و کەوت دەکەن. خواوەند بەچاکەکاری و خۆدورخستنەوە لەستەم و ئەمەکداری و چاکەخوازی بو ئێوەی بەسەر دوژمناندا زاڵ دەکرد و وڵاتەکانی دەخستە ژێر دەستی ئێوە. ئەگەر شێوەیەکی ترتان هەڵبژاردوە، جگە لەمە ناتوانم پێشبینی بکەم کە خواوەندیش شێوەکەی خۆی دەگۆڕێت و چارەنوسی ئێوەیش. من دڵنیام خوا فەرمانڕەوایی لەدەستی ئێوە دەردێنێت. هەندێك لەو کەسانەی خەڵکیان ئازاردەدا، هێنایانە لای رۆستەم و ئەو هەمویانی کوشت.

دواتر بەرێکەوت تا لەحیرە دابەزی و خەڵکەکەی بانگ کرد و ئاگاداری کردنەوە و ناهەنگی هێرش کردنە سەر ئەو شارەی کرد. کوری بوقەیلە پێی وت: ئێمە لەسەر ئەم کارە سەرکۆنەمەکە چونکە هاوکاری ئێمەت نەکرد و ئێستا سەرکۆنەمان دەکەیت بۆ دوژمنمان لەخۆمان دور نەخستۆتەوە.

کاتێك رۆستەم گەیشتە نەجەف، لەخەودا بینی فریشتەیەك هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەر(ص) و عومەر دابەزی. فریشتە کەل و پەلی شەڕی ئێرانیەکانی هەڵگرت و قوفڵی کرد و بەپێغەمبەر(ص)ی دا و پێغەمبەر(ص)یش بەعومەری سپارد. رۆستەم خەمبار بو.

سەعد چاوەڕوانی ناردنی دەستە شەڕکەرەکان و هێرشبەرەکانی دەکرد و رۆستەم

لەنەجەف و جالینوس لەنێوان نەجەف و سیلحین بون. ئەو سواد و حومەزیەی هەرکام لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر رەوانە کرد. ئەوان هێرشیان کردە سەر نەهرەین. ئەم هەواڵە بەرۆستەم گەیشت و چەندین سواری بەدوای ئەواندا رەوانە کرد. سەعد بیستی کەسوارەکانی ڕۆشتونەتە قوڵایی سەرزەمینی ئێران. لەبەر ئەمە عاصم کوڕی عەمرۆ و جابری ئەسەدی بەدوای ئەواندا نارد. عاصم ئەوانی بینی و بینی سوارەکانی ئێران بەدەوری ئەواندا دەسوڕێنەوە تا سامانە تاڵانکراوەکانیان لێ وەربگرنەوە. کاتێك ئێرانیەکان ئەویان بینی، هەڵاتن و موسوڵمانان بەتاڵانیەکانەوە گەڕانەوە. سەعد، عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب و تولەیحەی ئەسەدی وەك پێشەنگەکان رەوانە کرد. ئەم دوانە لەگەڵ دەپیاوی شەرکەر بەرێکەوتن. هیشتا فەرسەخێك و بەشێك لەفەرسەخێك نەرۆشتبون کەپێگەکانی دیدەوانی و مەڕوماڵاتەکەی ئەوانیان بینی کەسەراسەری ئەو ناوچەیان پرکردبو. عەمرۆ و هاورێکانی گەڕانەوە و تولەیحە پێداگری دەکرد لەسەر پێشڕەوی کردن. پێیان وت: تۆ پیاوێکیت خوازیاری فێڵ و مرۆڤ کوشتن، دوای کوشتنی عوکاشە کوڕی میحصەن رزگارت نابێت، لەگەڵ ئێمەدا بگەڕێرەوە. ئەو لەگەڵیان نەرۆشت. ئەوان گەڕانەوە بۆ لای سەعد و ئاگاداریان کردەوە کەئێرانیەکان نزیك بونەتەوە.

تولەیحە بۆ پێشەوە ڕۆشت تا گەشتە ناو قوڵایی سوپای ئێرانیەکان و شەوی لەناو ئەواندا بەسەر برد و دەستی بەلێکۆڵینەوە کرد. ئەو تەنافەکانی ماڵی پیاوێکی بڕی و ئەسپەکەی پێش خۆیدا. دواتر ڕۆشتە ناو ماڵێکی دیکە و ئەسپەکەی کردەوە و لەماڵی سێیەمیش ئەم کارەی دوبارە کردەوە. دواتر پەڕیە سەر ئەسپەکەی و بەغاردان ملی رێگای گرتەبەر. خەڵك لەکارەکەی ئاگادار بونەوە و بەسواری ئەسپ شوێنی کەوتن. ئەو دەرۆشت و کاتی بەیانی، سوارەیەك لەسوپای ئێران پێیگەیشت کەتولەیحە کوشتی و دواتر یەکیتر گەیشت و ئەویش کوژرا و کەسی سێیەم هات و مەرگی ئەو دو کەسەی بینی کەئامۆزای بون و کینە و رقی زیادی کرد. ئەو خۆی بەتولەیحە گەیاند و تولەیحە ئەسیری کرد. خەڵك پێی گەیشتن و دو سوارەکەیان بە کوژراوی و سێیەم سوارەیان بە ئەسیری بینی. لەم کاتەدا تولەیحە لەسوپاکەی خۆی نزیك ببویەوە. ئەوان لەشوێن کەوتنی دەستیان هەڵگرت. تولەیحە هاورێ لەگەڵ ئێرانیە ئەسیرەکە گەڕایەوە بۆ لای

سەعد و هەواڵی کارەکەی خۆی پێراگەیاند. وەرگێر لەشەڕکەرە ئێرانیە ئەسیرەکە دەستی بەلێکۆڵینەوە کرد و ئەو داوای ئەمانی کرد. سەعد ئەمانیدا و پیاو وتی: پێش ئەوەی باسی سوپای ئێرانیەکانتان بۆ بکەم، چۆنیەتی کاری ئەم پاڵەوانە گەورەیە بۆ ئێوە دەگێرمەوە: من لەو کاتەوەی منداڵێکی کەم تەمەن بوم، لەشەڕەکاندا بەشداریم کردوە و تا ئێستا بەمکارەوە سەرقاڵم. چیرۆکی زۆرم سەبارەت بەپاڵەوانەکان بیستوە، بەلاّم هاوشێوەی ئەم پاڵەوانەم نەبینیوە. هەروەها نەمبیستوە شەرکەرێك دوفەرسەخ رێگە ببڕێت و خۆی بەسوپایەکی حەفتا هەزار کەسی بگەیێنێت کەتیایدا هەردەکەس و خزمەتی پیاوێکی ئازا دەکەن. ئەو بەمەیش بەسەندەی نەکرد کەبەهێواشی هاتۆتە ناو سوپاکە و بەهێواشی بڕواتەدەر، بەڵکو پەردەی حورمەتی سوپاییەکانی دڕی و ڕۆشتە ناو ماڵەکانیان. کاتێك خۆمان بەو گەیاند یەکەم شەڕکەری کوشت کە دەیتوانی روبەروی هەزار سوارە ببێتەوە، دواتر دوەمی خستە سەر زەوی. دواتر من خۆم پێگەیاند و گومانم نیە لەپشت سەری خۆم کەسێکی وەك خۆم بەجێهێشتبێت. جیاواز لەوە، من دەمویست تۆڵەی خوێنی دو کەسی بنەماڵەکەی خۆم بکەمەوە بەلاّم لەبەرابەر ئەو مەرگم لەبەر چاوی خۆم بینی و ئەسیر کرام. دواتر شەڕکەری ئێرانی لەبارودۆخی سوپای ئێران ئاگاداری کردنەوە و باوەڕی هێنا و پەیوەستی تولەیحە بو. ئەولەو کەسانە بو ئازایانە لەشەڕی قادسیە بەشداری کرد. سەعد ناوی موسلمی لێنا.

رۆستەم رەوانە بو و جالینوس و برۆ بەستراو، بۆپێشەوە رۆیشتن. جالینوس لەبەرابەر زوهرە لەخواروی قەنتەرە دابەزی و برۆ بەستراو لەتیزن ئاوا و رۆستەم لەخەرارە دابەزی. دوبارە رۆستەم بەرێکەوت و لەقادسیە جێگیر بو. ماوەی ڕۆشتنی ئەو لەمەداین تا جێگیربونی لەقادسیە چوار مانگ بو. بەردەوام هیوایی ئەوەی دەکرد موسوڵمانان لەمانەوە لەوشوێنە بێزاربین و بگەڕێنەوە. دەترسا ئەو بەلاّیش بەسەر ئەودا بێت کەسەرردارانی پێشتر پێی گیرۆدە ببون. ئەو بۆ شەڕ کردن دژی ئەوان پەلەی نەبو بەلاّم بەردەوام لەلایەن پاشاوە هاندەدرا و خوازیاری پەلە کردن بۆ دەسپێکی شەڕ بو. ئەومندە بۆ پێشەوە هانی دەدا تا لەقوڕگی شەڕدا گیر بکات.

عومەریش بۆ سەعد نامەی نوسی و بۆ دواخستنی شەڕ و درێژەکێشانی ماوەکە فەرمانی پێدا. سەعد خۆی بۆ شەڕێکی دور و درێژ ئامادە دەکرد. کاتێك رۆستەم گەیشتە

قادسیە، لەعەتیق روبەروی سوپای سەعد ئوردوی لێدا و خەڵك دابەزین. ئێرانیەکان سوپا دوای سوپا دەگەیشتن تا لەبەر زۆری بونە هاوشێوەی شەوێکی ڕەش. موسوڵمانان بەهەمان شێوە چاوەڕوان بون و هێرشیان نەدەکردە سەر ئەوان. رۆستەم سی وسێ فیلی لەگەڵدا بو کە لەناو ئەوان یەکیان فیلە سپیەکەی شاپور بو. فیلەکان دەستەمۆ کرابون. ئەو لەناوەڕاستی سوپاکەی خۆی هەژدە فیلی دانا و لەسەر باڵی چەپ و راست پانزە فیل. کاتێك رۆستەم شەوی گەیاندە بەیانی، سوار ئەسپەکەی بو و عەتیقی بەرەو خەفان بەجێهێشت تا خۆی گەیاندە شوێنی کۆتایی سوپای ئیسلام. دواتر بەرەو سەرەوە رۆیشت. دواتر زۆر بەوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر موسوڵمانان کرد و لەقەنترە لەشوێنێك وەستا کەبتوانێت بەجوانی بەسەر ئەوان بڕوانێت. کەسی بۆ لای زوهرە نارد شوێنێکی بۆ کۆبونەوە دیاری کرد. دەیویست لەسەر بنەمای زێر و خواستەیەك کەبەوی دەدات، لەگەڵ ئەودا بەئاشتی بگات تا سوپاکەی پشت لەشەڕ بکەن بێ ئەوەی ئەم قسەیە بەدوژمنەکەی بڵێت بەڵکو بەشێوەیەك خۆی نیشان بدات کە: ئێوە دراوسێکانی ئێمە بون و ئێمە چاکەی زۆرمان لەگەڵ ئێوە دەکرد و ئێوەمان دەپاراست. ئەو دەیویست هەڵس و کەوتی چاکەی پاشاکانی ئێران لەگەڵ عەرەبەکانی بیربخاتەوە.

زوهرە پێی وت: کاری ئێمە لەگەڵ عەرەبە بیابانگەڕەکان وەك یەك نیە. ئێمە بۆ بەدەست هێنانی زێر و ماڵی ئەم دنیا نەهاتوینەتە سەر ئێوە بەڵکو هێرشمان کرد و هەمو مەبەستەکانی ئێمە بۆ ئەو دنیایە. ئێمە بەو شێوە بوین کە تۆ ئاماژەت پێدا تا ئەوەی خوا لەناو ئێمە پێغەمبەر(ص)ێکی هەڵبژارد و ئێمەی بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا بانگ کرد و ئێمە وەڵامی داواکەی ئەومان دایەوە. خوا بەپێغەمبەر(ص)ەکەی فەرمو: من ئەم خەڵکەم بەسەر ئەو کەسانەی لەئایینەکەی من نیگەرانن زاڵ کرد. من بەهێزی ئەم پێغەمبەر(ص)ە تۆڵە لەوان دەکەمەوە. تا ئەوکاتەی ببنە فەرمانبرداری دینەکەی من، سەرکەوتن دەکەمە بەشی ئەوان. ئەمە ئایینی راستی و دروستیە کەهیچ کەس پشتی تێ ناکات، مەگەر ئەوەی ریسوا بێت و هیچ کەس باوەڕی پێ ناهێنێت مەگەرئەوەی رێزدار بێت.

رۆستەم لێی پرسی: ئەم ئایینە چیە؟ زوهرە وتی: کۆڵەکەیەك لەم ئایینە تەنیا بەوە

بەهێز دەبێت، شایەتی دانە بەوەی کە: خوایەك جگە لەخوای محەممەد نیە و محەممەد پێغەمبەر(ص)ی ئەوە. رۆستەم پرسی: چیتر؟ زوهرە وتی: رزگار کردنی بەندەکان لەپەرەستینی بەندەکان بەرەو پەرەستینی خواوەند. خەڵك منداڵەکانی ئادەم و حەوان و براکان لەیەك دایك و باوکن. رۆستەم وتی: چەندە باشە! دواتر رۆستەم وتی: ئایا حەز دەکەیت من و خەڵکەکەم باوەڕ بەم ئایینە بێنین؟ دواتر کرداری ئێوە بەرامبەر بەئێمە چی دەبێت؟ دەتوانن بگەڕێنەوە؟ زوهرە وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا. رۆستەم وتی: لەگەڵ من راستت کرد. خەڵکی ئێران لەو کاتەوەی ئەردەشێر هاتۆتە سەر کار، بەڕەوایان نەدەزانی هیچ کەس لەژێردەستەکان واز لەکار وپیشەکەی خۆی بێنێت و کار وپیشەیەکی دیکە هەڵبژێرێت. بەوان دەوترا: لەسنورەکانی خۆیان تێپەڕیتن و پێیان خستەسەر گەورەکانی خۆیان. زوهرە وتی: ئێمە باشترینی خەڵکان بۆ خەڵکانین و لەبەر ئەمە ناتوانین بەو شێوەیە بین کەئێوە دەڵێن بەڵکو فەرمانی خوا سەبارەت بەژێردەستەکانی خۆمان بەکار دەبەین و لەوەی کەسانی دیکە لەکرداری خۆیان لەگەڵ ئێمە فەرمانەکانی خوا پشت گوێ بخەن، زیانمان بەرناکەوێت.

رۆستەم لای ئەو گەڕایەوە و پیاوە گەورەکانی سوپای ئێرانی بانگ کرد و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد بەڵام ئەوان لەرازی بون بەپێشنیارەکانی خۆیان بەدور گرت. ئەو کەسی بۆ لای سەعد نارد کە: پیاوێك بۆ لای ئێمە بنێرە تاگفتوگۆی لەگەڵدا بکەین. سەعد دەستەیەکی بانگ کرد تا بۆ لای رۆستەمی رەوانە بکات بەڵام رێبعی کوڕی عامر وتی: هەرکات بەکۆمەڵ بڕۆینە لای ئەوان بەو شێوەیە گومان دەکەن کەلەوان دەترسین، تەنیا یەك کەس بۆ لای ئەوان بنێرە.

سەعد ئەوی بەتەنیایی رەوانە کرد. ئەو ڕۆشتە لای ئەوان. ئەویان لەقەنتەرە جێگیر کرد و رۆستەمیان لەهاتنەکەی ئاگادار کردەوە. رۆستەم بەتەواوی خۆی رازاندەوە و لەسەر تەختێکی زێرین دانیشت و چەندین باڵشت و دۆشەکی بەزێر چنراوی راخست. رێبعی سوار لەسەر ئەسپ هات. شمشێرەکەی لەکاڵانێکی چەرمیندا بو و ڕمەکەی بەشێوەیەکی پەرێشان و شل بەسترابویەوە. کاتێك گەیشتە راخەڕە گرانبایەکان، پێیان وت: وەرە خوار. ئەو ئەسپەکەی خۆی بۆ پێشەوە غاردا وبەدەوری ئەمامێکدا بەستیەوە. ئەوان رێگەیان لێنەگرت. رێبعی زرێیەکی لەبەردابو. کۆپانی وشترەکەی خۆی هەڵگرت و

کردیەبەری و بەخۆیەوە بەستیەوە. پێیان وت: شمشێرەکەی خۆت دابنێ. وتی: نەهاتوم تا بەفەرمانی ئێوە شمشێرەکەم دابنێم، ئێوە بانگێشتی منتان کردوە. رۆستەمیان ئاگادار کردەوە. وتی: فەرمانی پێبدەن. ئەو پشت بەستو بەرمەکەی هەنگاو بەهەنگاو رۆشتە پێش و پێی دەخستە سەر هەر راخەر و فەرشێك، دەیدڕاند و خراپی دەکرد. کاتێك گەیشتە لای رۆستەم، لەسەر زەوی دانیشت و رمەکەی لەفەرشەکە چەقاند. پێیان وت: بۆ ئەم کارەت کرد: وتی: حەز ناکەم لەسەر راخەرە رازاوەکانی ئێوە دابنیشم. وەرگێرەکەی رۆستەم کەناوی عبود و لەخەڵکی حیرە بو، پێی وت: چ هۆکارێك ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە؟ رێبعی کوڕی عامیر وتی: خوا ئێمەی هێناوەتە ئێرە. ئەو ئێمەی ناردوە تا هەر کەس لەبەندەکانی کەبیەوێت، لە شوێنە تەسك و تەنگەکانی ئەم جیهانە بۆ شوێنە فراوان و بەربلاوەکان ببەین و لەستەمکاری دینەکانی دیکە بۆ دادپەروەری ئیسلام رێنوێنیان بکەین. ئەو ئێمەی هاورێ لەگەڵ ئایینەکەی خۆی بۆ لای بەندەکانی ناردوە. هەر کەس پێی رازی بێت، پێی رازی دەبین و لەسەرزەمینەکەی خۆی دەیهێڵینەوە و کارمان پێی نابێت. هەر کەس رازی نەبێت، شەڕی لەگەڵ دەکەین تا سەرکەوین یا بۆ بەهەشت بڕۆین. رۆستەم وتی: قسەکانی ئێوەم بیست، ئایا دەتوانن ئەم کارە بۆ کاتێکی دیکە دوا بخەن تا بەباشی تێفکرینی بۆ بکەین؟ رێبعی وتی: بەڵێ، لەو یاسایانەی پێغەمبەر(ص) بۆی داناوین، یەکیان ئەوەیە زیاتر لەسێ رۆژ دەرفەت بەدوژمنانمان نەدەین. ئێستا بۆ ماوەی سێ رۆژ کاتتان پێ دەدەین، تۆ لەم سێ رۆژەدا بەجوانی لەکارەکانی خۆت تێفکرە و لەکۆتاییدا یەکێك لەم سێ کارە هەڵبژێرە: یا ئیسلام کەتۆ دەگەڕێنینەوە بۆ سەرزەمینەکەت، یا باج کەپێی رازی دەبین و دەست لەتۆ هەڵدەگرین و ئەگەر پێویستت بو یارمەتیت دەدەین یا روبەروبونەوە لەرۆژی چوارەم مەگەر ئەوەی پێش ئەم کاتە تۆ شەڕ دەسپێبکەیت. من لەلایەن هاوەڵانی خۆمەوە پێبەندی خۆمان بەم وتانە رادەگەێنن. رۆستەم پرسی: ئایا تۆ سەروەری ئەوانیت؟ رێبعی وتی: نا یەکێکم لەوان بەلام موسوڵمانان وەك یەك جەستەی تاقانەن و ئەندامەکانی جەستەی یەکترن. ئەوکەسەی بێ رێزترینی ئەوان پەنای بدات، رێزدارترینی ئەوان دەیپارێزێت.

رۆستەم لەگەڵ سەرکردەکانی سوپاکەی خۆی راوێژی کرد و وتی: ئایا هەرگیز وتارێکی

بەشكۆتر و رێزداتر و رونترتان لەم وتاری ئەم پیاوە بیستوە؟ وتیان: پەنا بەرخوا ئەگەر بچینە سەر ئایینی ئەم سەگە عەرەبانە! ئایا جل و بەرگەكەیت نەدی؟ رۆستەم وتی: هاوار لەئێوە! لەجل و بەرگی جەستە مەڕوانن بەڵكو لەوتار و كردار و ناوەرۆكی ئەندێشەكەی تێفكرن. عەرەبەكان گرنگی بەجل و بەرگ نادەن و رێز لەگیان دەگرن. هەرگیز ئەوان وەك ئێوە نین.

كاتێك بەیانی داهات رۆستەم كەسی بۆ لای سەعد نارد كە: دوبارە ئەو پیاوە بنێرە بۆ لای ئێمە. سەعد ئەمجارە حوزەیفە كوڕی مێحصەنی رەوانە كرد كە بەهەمان شێواز و جل و بەرگ رۆشتە لای رۆستەم و لەئەسپ دانەبەزی و سوارە لەسەر سەری رۆستەم وەستا. وتی: دابەزە. وتی: نا. رۆستەم وتی: بۆ تۆ هاتویت وئەو پیاوەی دوێنێ نەهات. وتی: چونكە فەرماندەكەی ئێمە دەیەوێت لەسەختی وئاسایش وەك یەك هەڵس و كەوتمان لەگەڵدا بكات و لەبەر ئەمە نۆرەی من گەیشت. رۆستەم وتی: بۆ هاتون بۆ ئێرە؟ حوزەیفە وەلآمێكی هاوشێوەی یەكەمی دایەوە. رۆستەم وتی: یا ئەمە یا چاوەڕوانی تا رۆژێكی زانراو. حوزەیفە وتی: بەڵێ، سێ رۆژ لەدوێنێوە. رۆستەم ئەوی گەڕاندەوە و روی كردە هاوەڵانی خۆی و وتی: هاوار لەئێوە، ئایا ئەوەی من دەیبینم، ئێوە نایبینن؟ پیاوی یەكەم دوێنێ هات و ئێمەی لەسەرزەمینەكەمان ریسوا كرد وئەوەی بەگەورەی دەزانین، بەسوك و ناگرنگی لەقەڵەمدا و بەئەسپەكەی خۆی هاتە سەر فەرشی بەزێرچنراوی ئێمە. ئەمڕۆ یەكی دیكە هات و وەك باڵندەیەكی خۆشبەخت لەسەر سەرمان وەستا.

كاتێك بەیانی داهات، كەسی نارد كە: پیاوێك بۆ لای ئێمە رەوانە بكەن. ئەمجارە موغەیرە كوڕی شوعبەیان رەوانە كرد. ئەو روی كردە ئەوان و ئەمان تاجی زێرینیان لەسەر سەر و جل و بەرگی بەزێرچنراویان لەبەردا و راخەری گرانباییان لەژێر پێدابو كەجگە لەتێپەڕین لای ئەوان بینینی گەورەكەیان ئەگەری نەبو. موغەیرە روی كردە سەرەوەی كۆڕەكە و لەگەڵ رۆستەم لەسەر تەختەكە دانیشت. ئەویان گرت و هێنایانە خوار و سوكیان كرد و لێیاندا. موغەیرە وتی: لەئێوەوە هەواڵی دڵخۆشكەرمان بەدەست دەگەیشت بەڵام ئەمڕۆ لەئێوە نەزانتر نابینم. ئێمە عەرەبەكان نابینە كۆیلەی یەك و یەكتر ناكەینە كۆیلە. وامدەزانی ئێوەیش لەسەر بنەمای بەرابەری لەگەڵ یەك هەڵس و

کەوت دەکەن. باشتر لەم کارە ئەوەبو بەمن بڵێن کەخواکانی یەکترن. ئەم کارە لەناو ئێوەدا نامێنێت و لەم چەشنە کارە لەهیچ کەسێك ناوەشێتەوە. من نەهاتومەتە لای ئێوە، بەڵکو ئێوە منتان بانگێشت کردوە. هەنوکە باش دەزانم تێکدەشکێن چونکە پاشایەتی لەسەر ئەم بنەمایە و ئەم شێوازە پایەدار نابێت. ژێردەستەکان وتیان: سوێند بەخوا پیاوی عەرەب راست دەکات. دێدارەکان وتیان: سوێند بەخوا قسەیەکی کرد هێشتا بەردەکان شەیدای ئەو قسەن. خوا یەکەم کەسانی ئێمە بکوژێت کەرێزیان لەم خەڵکە و کارەکانیان نەدەگرت.

دواتر رۆستەم دەستی بە قسە کردن کرد. ئەو رێزی لەخەڵکەکەی گرت و ئەوانی گەورە کرد و وتی: ئێمە بەردەوام لەوڵاتەکاندا سەرکەوتو بوین و لەبەرابەر دوژمنان بەهێز و لەناو خەڵکانی دنیا سەربڵند. هیچ کەسێك پاشایەتی و شکۆی وەك ئێمەی نیە. بەسەر خەڵکدا زاڵدەبین و کەس بەسەر ئێمەدا زاڵ نابێت مەگەر بۆ رۆژێك یا چەند رۆژێك و بەزۆری یەك مانگ کەئەویش دواهاتی تاوانباریمانە لەبەرابەر یەزدانی پاك. دوبارە کاتێك خوا کینەی خۆی لەسەر ئێمە هەڵگرێت و لەئێمە رەزامەند و شادمان بێت، لەبەرژەوەندی ئێمە چەرخی رۆژگار دەسوڕێنێت و ئێمە بەسەر دوژمناندا زاڵ دەکات. لەناو خەڵکان، خەڵکێکی سوکتر و ریسواتر لەئێوە لای ئێمە نەبون. ئێوە خەڵکانێکی گەورە و ژیانێکی شەرمێنەرتان بو و ئێمە بەهیچمان لەقەڵەم دەدا و بەسوکمان دەزانی. کاتێك وشکەساڵی گرفتاری دەکردن، دەهاتنە لای ئێمە و ئێمە کەمێك خورما و جۆمان بەئێوە دەبەخشی و رەوانەمان دەکردنەوە. من دەزانم چ شتێك ئێوەی بۆ ئەم کارە ناچار کردوە، سەختی و دژواری لەسەرزەمینەکەتان. ئێستا فەرمان دەدەم ئێسترێك و هەزار درەم و جل وبەرگی رازاوە بەفەرماندەکەتان بدەن و بەهەرکام لەئێوە بارێك خورما تا بۆماڵەکانتان بگەڕێنەوە چونکە نامەوێت ئێوە کوشتار بکەم.

موغەیرە کوڕی شەعبە دەستی بەقسە کردن کرد. ئەو سوپاسی خوای کرد و وتی: خواوەند ئافرێنەر و رۆزیدەری هەر کەس و هەر شتێکە. هەر کەس هەر کارێك بکات دەبێت بزانێت خوا ئەو کارەی کردوە. ئەوەی سەبارەت بەخۆت و وڵاتەکەت باس کرد، ئاگادارین لێی. ئەمە کاری خوایە و لەبەر ئەمە ئەم رێز گرتنە هی خوایە نەك هی ئێوە. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەدژواری و گرفتاری عەرەبەکان و شەڕ و ناسازگاریەکانی

ئێمە ئاماژەت پێدا، بەراستی دەزانین و بەدرۆی لەقەڵەم نادەین. خواوەند ئێمەی بەو چارەنوسە تاقی کردەوە. خواستەکانی ئەم دنیا وسەرومری، لەگۆیەك دەچێت کەهەر رۆژ دەکەوێت دەست کەسێك یا لەژێر پێی کەسێك جێگیر دەبێت. هەروەها دەبێت بزانیت گرفتارانی بەدبەختی و سەختی بەردەوام چاوەروانی سەرکەوتن و خۆشبەختین و لەو رێگادا شەڕدەکەن تا پێی دەگەن. کەسانی ئاسودە و نوقمی شادمانی بەردەوام نیگەرانی دژوارین کە بەسەر ئەواندا ببارێت. ئەگەر بۆ ئەو شتانەی خوا بەئێوەی بەخشیوە، سوپاستان دەکرد، سوپاسەکەتان دەبوە هۆی بەردەوامی ئەوەی کەلکی لێوەردەگرن بەلام کەمی سوپاس کردن، رۆژگاری ئێوە دەگۆڕێت، هەروەها ئەگەر لەوەی ئێمە گرفتار بوین پێی، ناسوپاسیمان دەکرد، گەورەترین تاقی کردنەوە کە بەسەر ئێمەدا دەهات، ئەوە بو کەهەمان رۆژگاری خراپ، خۆشەویستیەك لەلایەن خواوە بەئێمە دەبەخشێت و ماوەیەك ئارامی و ئاسایشمان پێدەدات. خوای گەورە و رێزدار لەناو ئێمە پێغەمبەر(ص)ێکی هەڵبژارد.

دواتر ئەوەی ئاماژەی پێدرا، لەباوەڕهێنان و باج و شەڕ، باسی کرد و پێی وت: بنەماڵەکانی ئێمە تامی ولاتەکەی ئێوەیان چێشتوە و دەڵێن، زیاتر ناتوانین بۆ دوری ئەو خۆمان رابگرین.

رۆستەم وتی: بەمشێوەیە بێ گەشتن بەولاتەکەی من دەمرن. موغەیرە وتی: ئەوانەی لەئێمە بکوژرێن دەڕۆنە بەهەشت و ئەوەی لەئێوە بکوژرێت، دەڕواتە جەهەننەم و پاشماوەکانی ئێمە بەسەر پاشماوەکانی ئێوەدا زاڵ دەبن.

رۆستەم تورە بو و سوێندی خوارد پێش بەرەبەیان هەمویان کوشتار دەکات. موغەیرە گەڕایەوە و رۆستەم لەگەڵ ئێرانیەکان راوێژی کرد و وتی: ئەمانە لەکوێن و ئێوە لەکوێ! سوێند بەخوا پیاوان ئەمانەن چ راست بکەن چ درۆ! ئەگەر فرمزانی و رازداری ئەوان تا ئەم ئەندازەیە بێت کە لەناوخۆیان ناتەبا و ناسازگار نەبن، هیچ خەڵکێك وەك ئەوان ناتوانن پەیامەکەیان بەباشی بگەیێنن. ئەگەر راستگۆ بن، هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. کەواتە خۆڕاگری و پێداگری بکەن و چوست و چالاك بن.

رۆستەم کەسی بۆ لای موغەیرە نارد و وتی: کاتێك بەیانی جسرەکە بپچڕێت، چاوی

کوێر دەبێت. نێردراو پەیامەکەی گەیاند و موغەیرە وتی: مژدەی چاکە و پاداشتت بەمندا. ئەگەر ئەوە نەبوایە کەئەمڕۆ دەمەوێت لەگەڵ بتپەرەستانی وەك ئێوە شەڕبکەم، ئارەزوم دەکرد، چاوەکەی تریشم کوێر بوایە. نێردراو گەڕایەوە و ڕۆستەمی لەوتەکانی موغەیرە ئاگادار کردەوە. ڕۆستەم وتی: ئەی خەڵکی ئێران، فەرمانبرداری من بکەن چونکە من بۆخوا لەزیانی ئێوە رق و گرفتاری دەبینم کەناتوانن ڕێگر بن لێی. دواتر سەعد چەند بیرمەندێکی دیکەی بۆ لای ڕۆستەم نارد و ئەوان سیان بون ڕۆشتن و وتیان: فەرماندەی ئێمە داوای شتێك لەتۆ دەکات هەم بۆ تۆ باشترە و هەم بۆ ئێمە. تەندروستی و رزگاری لەوەدایە، بەوەی پێت دەڵێین رازی بیت و بۆ وڵاتەکەی خۆت بگەڕێیتەوە. وڵاتەکەی خۆتان بۆخۆتان و خۆتان کاروبارەکەی بەرێوە ببەن و ئەوەی بەدەستی دێنن، تایبەت بێت بەئێوە و ئێمە نامانەوێت. هەرکەس هێرش بکاتە سەر ئێوە، هاوکاریتان دەکەین. لەخوا بترسە نەکا لەناوچونی خەڵکەکەت لەسەر دەستی تۆبێت. لەنێوان تۆ و ئەو پێگەی کەسانی دیکە رژدیت پێببەن، هیچ نەماوەتەوە، مەگەر ئەوەی باوەڕی پێ بێنیت و بەم کارە، دێو لەخۆت دوربکەیتەوە.

ڕۆستەم وتی: وتەی کورتی بیرمەندانە، لەزۆر وتارەکان رونتر و ئاشکراترە. ئێوە خەڵکانێك بون بەسەختی و بەدبەختی ڕۆژگارتان بەسەر دەبرد و هیچ پشتیوانێکتان نەبو، پارێزگاریتان لێ بکات. خواردنمان بەئێوەدا و چاکەمان لەگەڵدا کردن. کاتێك خواردن و خواردنەوەی ئێمەتان خوارد، بۆ خەڵکەکەی خۆتان وەسف کرد و هانتان دان و هەموتان لای ئێمە کۆبونەوە. داستانی ئێوە لەداستانی ئەو پیاوە دەچێت کەچەندین ڕەزی بو. ڕۆژێك ڕێویەکی تیا بینی و وتی: چ ڕێویەك! ڕێوی ڕۆشت و چەندین ڕێوی دیکەیشی بۆ ئەو ڕەزە هێنا. کاتێك لەوێ کۆببونەوە، خاوەندی ڕەزەکە، ئەو کونەی لێوەی هاتبون، بەستی و هەموویانی کوشت. من تێگەیشتم ئەوەی ئێوەی بۆ ئەم کارە هانداوە، تەماحکاری و بەدبەختی ئێوەیە. بگەڕێنەوە و خواردن و توێشوتان پێدەدەم چونکە من ئارەزوی کوشتار کردنی ئێوەم نیە. هەروەها داستانی ئێوە لەداستانی ئەو هەنگە دەچێت کەهەنگوین دەبینێت و دەڵێت: هەرکەس من بەو هەنگوینە بگەیێنێت، دو درەمی پێ دەبەخشم. کاتێك دەڕواتە ناو هەنگوینەکە و تێی دەکەوێت، دەڵێت: هەر کەس من دەربێنێت، چوار درەمی پێدەبەخشم. هەروەها وتی: پیاوێك سەوەتەیەکی

لەسەر زەوی دانا و خواردنی تێکرد. مشکەکان هاتن و سەوەتەکەیان کون کرد و ڕۆشتنە ناوی. ئەو ویستی کونی مشکەکان بگرێت. پێیان وت: ئەو کونە مەگرە چونکە جارێکی دیکە دەیدڕێنن و کونێکی دیکە دروست دەکەن. ڕێگایەکیان بۆ دروست کە و قامیشێکی ناوبەتاڵی تیادانێ، با لەکونەکەوە بڕۆنە ناو و لەقامیشەکەوە بێنەدەر. هەرچی لەقامیشەکە هاتەدەر بیکوژە. ئێستا بزانن منیش لەگەڵ ئێوە ئەو کارەم کردوە و ڕێگەی ڕۆشتنە دەرەوەتانم بەستوە. ئاگادار بن بڕۆنە ناو قامیشەکە چونکە هەرکەس بڕواتە ناو قامیشەکە، ڕێگەی گەڕانەوەی نابێت و کاتێك بێتەدەر، دەکوژرێت. چ هۆکارێك بۆ ئەم کارە پاڵی پێوەناون؟ نە سوپایەکی ئەوتۆ دەبینم نە ئامادەبون بۆ شەڕ و نەساز و بەرگ و کەرەستەی شەڕ و بار و بنەیەکی ئەوتۆ!

دەڵێت: ئەو کەسانە دەستیان بەقسە کردن کرد و باسی خراپی ڕۆژگاری خۆیان کرد و وتیان چۆن خوا بەخشینەکانی خۆی بەوان بەخشیوە و پێغەمبەرێکی لەناو ئەواندا هەڵبژاردوە و کاتێك کە لەناو خۆیان بەشەڕ و ناسازگاری بەسەریان بردوە بەهاتنی ئیسلام، هاودەست و هاوپەیمان بون. دواتر پێغەمبەر(ص) فەرمانی شەڕی بەوان داوە. وتیان: بەڵام ئەو داستانانەی ئاماژەت پێدان، نە شیاوە بۆ ئێمە و نەسزای ئێمەیە بەڵام داستانی ئێوە لەداستانی پیاوێك دەچێت کەزەوی بکێڵێت و داری تیا بڕوێنێت و بەجۆگە و کۆشکەکان بیرازێنێتەوە و تیایدا وەرزێرەکان نیشتەجێ بکات تا لەو کۆشکانەدا بحەوێنەوە و لەناو باخەکاندا پیاسە. وەرزێرەکان لە کۆشکەکان بۆ کارە نارەواکان هاوپەیمان ببن و دەرفەت دان بەوان درێژە بکێشێت و شەرم نەکەن. خاوەندی باخەکە کەسانێتر دەباتە ئەوێ و ئەوان لەوێ دور دەخاتەوە. ئەگەر لەوێ بڕۆنەدەر، خەڵکان دەیانڕفێنن و ئەگەر بمێننەوە، دەبنە کۆیلە تازە هاتوان کە تا ڕۆژی دوایی ئەشکەنجەیان دەدەن. سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی دەیڵێم، ڕاست نەبوایە و تەنیا ئەم دنیا بونی بێت، لەسەر ئەوەی باوەڕمان پێیەتی، نەماندەتوانی لەبەرابەر ژیانی خۆش و ڕازاوەی ئێوە خۆراگری بکەین و چاومان دەبڕیە زێر و گەوهەرەکانی ئێوە و لەسەر ئەوانە شەڕی ئێوەمان دەکرد.

ڕۆستەم وتی: بەرەو لای ئێمە دێن، یا ئێمە بەرەو لای ئێوە بێین؟ وتیان: ئێوە وەرن. ئەوان شەوانە بۆ لای سەعد گەڕانەوە. سەعد خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە تا

لەشوێنەکانی خۆیان جێگیر بن. پەیامی بۆ ئێرانیەکان نارد، هەنوکە ئێوەن و هاتن بۆ لای ئێمە. ئەوان ناهەنگی قەنتەرەیان (جسر)کرد و سەعد وتی: نابێت و بەهیچ شێوەیەك ڕێزی ئێوە ناگیرێت! ئەوەی بەزۆر لەئێوە بستێنین، بۆ ئێوەی ناگەڕێنینەوە. ئەوان شەویان تابەیانی بەلێوانلێو کردن و پڕکردن و بەستنی عەتیق بەخاك و قامیش و دار بەسەر برد.

ڕۆستەم ئەو شەوە لەخەودا بینی وەك بڵێی فریشتەیەك لەئاسمانەوە هات و کەوانی سوپاکەی ئەوی گرت و قوفڵی کرد و بۆ ئاسمانی برد. ئەو خەمبار لەشوێنەکەی هەستا و کەسانی تایبەتی خۆی بانگ کرد و وتی: خوا ئامۆژگاریمان دەکات ئەگەر ئامۆژگاری وەربگرین. کاتێك ڕۆستەم سوار بو و ویستی بڕوات، دو زرێ و خودەیەکی پێبو. کەل وپەلی شەڕی هەلگرت و سوار ئەسپەکەی بو. وتی: بەیانی وەك گەنم دەیانکەین بەئارد! پیاوێك وتی: ئەگەر خوا بیەوێت. ڕۆستەم وتی: تەنانەت ئەگەر نەیەوێت. ڕۆستەم وتی: کاتێك شێر (یانی خوسرەو) مرد، ڕێوی سوك بو و من دەترسم ئەم ساڵ ساڵی مەیمونەکان بێت! ئەم قسانەی بۆیە کرد تا موسوڵمانەکان لای ئێرانیەکان سوك بکات و گەرنە، ئەوەی لەو دەگێڕنەوە، ترسی قووڵی بو لەموسوڵمانەکان. ئەو ئەم ترسەی لای بڕواپێکراوەکانی خۆی ئاشکرا کرد.

## شەڕی ئەرماس

کاتێك ئێرانیەکان لەعەتیق تێپەڕین، ڕۆستەم لەسەر تەختەکەی خۆی دانیشت. لەسەر سەری ئەو چەتر یا سایەوانێکیان هەلگرد. ئەو لەناو دڵی سوپاکەی خۆی هەژدە فیلی دانا و لەناو ئەوان پیاوە شەڕکەرەکان. لە دوباڵی ڕاست و چەپ هەشت فیلی لێبو. جالینوسی لەنێوان خۆی و باڵی ڕاست جێگیر کرد و فیروزانی لەنێوان خۆی و باڵی چەپ. یەزدگێرد لەنێوان خۆی و ڕۆستەم پەیکی دانا بو: تا هەر شوێنێك کەدەنگی کەسێك دەگات، یەك کەس. یەکەم کەسی ئەوان لەبەردەرگای هەیوانەکەی و دوایین کەسیان لای ڕۆستەم. هەرجار کەڕۆستەم کارێکی دەکرد، ئەوەی لەگەڵیدا بو، هەواڵەکەی بەجارچی دوای خۆی دەدا کە: ئەمە و ئەوە وترا. دواتر کەسی دوەم بەکەسی دوای خۆی دەوت بەم شێوەیە هەواڵەکانیان بەدەنگی بەرز بەیەك ڕادەگەیاند تا لە کورتترین

ماوەدا دەگەیشتە یەزدگێرد. موسوڵمانەکان ریزەکانی خۆیان چڕکردەوە و تیایدا جێگەیان گرت.

سەعد چەندین دومەڵی پێوەبو. ئەو بەروی دەرگاکەدا کەوتبو و باڵشێك لەژێر سکیدا و لەسەروی کۆشکەکەی سەیری خەڵکانی دەکرد و ریزی شەڕکەران لەبەردەم کۆشکەکەی ئەودا بون. ئەگەر ئەو ریزانەی سوپای موسوڵمانان بەدرێژایی ماوەیەك کەمتر لەدۆشینی شیری وشترێك، لێی دوردەکەوتنەوە و هاوکاری ئەویان نەدەکرد، هەمویان بەیەکجاری دەرفێنران. ترسی ئەو رۆژانە لەنازایەتی و بوێری سەعدی کەم نەکردەوە. خەڵك ئاماژەیان بەمەدەدا و بۆ ئەم کارەی رەخنەیان لێدەگرت: یەك لەوان وتی:

| | |
|---|---|
| نقاتل حتى انزل الله نصره | و سعد بباب القادسية معصم |
| فابنا و قد امت نساء كثيرة | و نسوة سعد ليس فيهن ايم |

یانی: ئەوەندە شەڕدەکەین تا خوا سەرکەوتنمان بۆ بنێرێت و سەعد لەدەروازەی قادسیە ئارام و بەهێز دانیشتوە. ئێمە گەڕاینەوە بەو شێوەی ژنانی زۆر ببونە بێوە بەڵام لەناو ژنانی سەعد بێوەیەك نەدەبینرا.

ئەم قسە بەگوێی سەعد گەیشت و وتی: ئەی خوایە، ئەگەرئەوەی دەیڵێت درۆیە ولەرێگەی خۆنواندن و گەیاندنی دەنگی خۆی بەخەڵکانە، زمانی لەمن دور بکەرەوە! ئەو بەهەمان شێوە لەناو ریزەکاندا وەستا بو کە لەناکاو تیرێك لەتیرهاوێژێکی نەزانراو لەزمانی چەقی. ئەو تەنانەت یەك وشەی نەهێنایە سەرزمان تاپەیوەستی خواوەند بو. جەریر کوڕی عەبدالله و هاوشێوەکانی ئاماژەیان بەروداوێکی لەم شێوە داوە. سەعد هاتە لای خەڵك و لای ئەوان داوای لێبوردنی کرد و برینەکانی سەر ڕان و سمتی نیشانی خەڵکدا. خەڵك بەحاڵی ئەویان زانی و لێیخۆشبون. کاتێك لەسوار بون ناتەوان بو، خالید کوڕی عورفتەی کردە جێگری خۆی. لەسەر ئەم کارە ناسازگاری دروست بو لەبەر ئەمە سەعد چەند کەسێك کەبەزیانی ئەو قسەیان کردبو، گرتنی و لەکۆشکەکەدا زیندانی کردن. یەك لەوان ئەبو مەحجەنی سەقەفی بو. ئەو بەندی کردە پێی ئەوان. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە ئەبو بەڵکو زیندانی کردنی ئەبو مەحجەن لەبەر شەراب خواردنەوە بو. خەڵکی ئاگادار کردەوە کەخالیدی کردۆتە جێگری خۆی و لەمەدوا خالید فەرماندەیی دەکات. خەڵك گوێرایەڵیان کرد و فەرمانیان برد. ئەو لەم رۆژەدا

لەناو خەڵکدا وتاریدا و ئەمە ڕۆژی دوشەممەی موحەرەمی ساڵی چواردەیەم / مارسی ٦٣٥ زایینی بو. سەعد خەڵکی بۆ شەڕ لەرێگەی خوادا هاندا و ئەوەی خوا سەبارەت بەگرتنی شارەکان مژدەی پێداون و سەرکەوتنەکانیان لەبەرابەر ئێرانیەکانیان و ئەوەی بەدەستیان هێناوە، بیری خەڵکەکە خستەوە. فەرماندەی دەستەکانی دیکەیش ئەم کارمیان دەکرد. سەعد دەستەیەکی لەفرزانەکان و پاڵەوانانی شەڕ رەوانە کرد و فەرمانی پێدان خەڵك بۆ شەڕ کردن هان بدەن. ئەوان ئەم کارمیان کرد و ئەم کەسانە لەناویاندا بون: موغەیرە، حوزەیفە، عاصم، تولەیحە، قەیس، ئەسەدی، غالب، عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب، و کەسانیتر و لەوتاردەرەکان: شەماخ، حوتەیئە، ئەوس کوڕی مەغرا ، عوبەیدە کوڕی تەبیب و کەسانی دیکە.

ریزی ئاگرپەرستەکان لەسەر لێواری عەتیق بو. ریزی موسوڵمانەکان تا دیواری قودەیس و خەندەق درێژ ببویەوە. موسوڵمانان و بتپەرستەکان لەنێوان خەندەق و عەتیق بون. لەگەڵ ئێرانیەکان سی هەزار کەس بەزنجیر بەسترابونەوە. سەعد فەرمانیدا سوریە پەیکار (سوڕەی ئەنفال، سوری هەشتەمی قورئان) بۆ خەڵك بخوێننەوە. کاتێك خوێندیانەوە، دڵی خەڵك نەرم و ئارام و خەڵك بەبیستنی ئاسودە و چاویان رون بو. کاتێك خوێنەران لەخوێندنی قورئان تەواو بون، سەعد وتی: لەشوێنەکانی خۆتان بمێننەوە و نوێژی نیمەڕۆ بخوێنن. من یەکجار تەکبیر دەڵێم و ئێومیش یەکجار و بۆ شەڕ خۆتان ئامادە بکەن. کاتێك بۆ دوەم جار تەکبیرم وت، ئێومیش بیڵێن و شوێنەکانی خۆتان بگرن. کاتێك تەکبیری سێیەمم وت، بیڵێن وفەرمان بەسوارەکانی خۆتان بدەن خەڵك بۆ شەڕ هانبدەن. کاتێك بۆ جاری چوارەم تەکبیرم وت، هەموتان بەیەکجار هێرش بکەن و روبەروی دوژمن ببنەوە. بڵێن، هیچ هێزێك نیە جگە لەخوا. کاتێك سەعد بۆ جاری سێیەم تەکبیری وت، بەهێزان و شەڕکەران هاتنەدەر و ئاگری شەڕیان داییساند. لەناو ئێرانیەکان، شەڕکەران هاتنەدەر و شەڕی شمشێر و ڕمیان دەست پێکرد.

غالب کوڕی عەبدالله ئەسەدی وتی:

| | |
|---|---|
| قد علمت و اردة المشائح | ذات اللبان و البيان الواضح |
| انى سمام البطل المسالح | و فارج الامر المهم الفادح |

یانی: پێشەنگە بوێرەکان و سینە پانەکان و قسە رونەکان باش دەزانن، من لەبەرامبەر

بەرابەرەکەم، شەڕکەرێکی توند و خێرا و چالاکم و بکەری کارە بەهادار و گرانەکان.

هورموز کە لەپاشاکانی (باب) و تاجێکی لەسەردا بو، روبەروی بویەوە. غالب ئەسیری کرد و هێنایە لای سەعد و گەڕایەوە. عاصم هات و وتی:

قد علمت بیضائ صفراء اللب مثل اللجین اذ تغشاه الذهب

انی امرؤ یعیبه السبب مثلی علی مثلك یغریه العتب

یانی: ئەو سپی پێستە گەردن زەردە، ئەوەی لەسیمێك دەچێت بەزێر سواخیان دابێت، دەزانێت من پیاوێکم خزمایەتیەکان لێم کەم ناکەنەوە، کار گران و قورسەکان (یانی شەڕ) هاوشێوەی کەسێکی وەك من بۆ کەسێکی هاوشێوەی تۆ هان دەدات.

ئەوشوێن سوارەیەکی ئێرانی کەوت کە هەڵات. عاصم شوێنی کەوت تا کەوتە ناو ریزەکانی ئەوان و روبەروی بویەوە. ئەویان لەبەرابەر عاصم پاراست. عاصم هێرشی کردە سەر پیاوێکی ئێستر سوار و گرتی و بینی ئەو نانەوای پاشایە و برێك لەخواردنی پاشا و ئەندازەیەك شیرینی خورما - رۆنی پێیە. هێنای بۆ لای سەعد. سەعد شیرینیەکانی لەناو هاوەڵانی خۆی دابەش کرد. ئێرانیەکی دیکە هاتەدەر و داوای شەڕکەری کرد. عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب روبەروی بویەوە. ئەوی گرت و کێشای بەزەویدا و سەری بڕی و دو دەستبەند و کەمەربەندە زێرینەکەی ئەوی هەڵگرت. لەم کاتەدا فیلەکان هێرشیان هێنا و لەناو دەستە شەڕکەرەکاندا بلاو بونەوە. ئەسپەکان ڕەمیان کرد. ئێرانیەکان بەحەفدە فیل ئاهەنگی هۆزی بوجەیلەیان کرد. ئەسپەکان رەمیان کرد و ئەوەندەی نەمابو خەڵکی بوجەیلە بەهۆی رمکردنی ئەسپەکان لەبەرابەر فیلەکان و فیل سوارەکان لەناو بچن. توڵەیحە کوڕی خومیلد و حەمال کوڕی مالك لەگەڵ دەستە شەڕکەرەکانی خۆیان هاتنەدەر و دەستیان بەلێدانی فیلەکان کرد تا پاشەکشێیان پێکردن. یەکێك لەگەورەکانیان روبەروی توڵەیحە بویەوە کە لەسەر دەستی توڵەیحە کوژرا. ئەشعەس کوڕی قەیس لەناو کەندە هەستا و وتی: ئەی کەندیەکان، خۆزگەم بەرۆژگاری بەنی ئەسەد کەچەند کاری گەورەیان ئەنجام دەدا و چەندە بوێریان لەخۆیان نیشان دەدا و چۆن بەرگریان لەشوێنەکانی خۆیان دەکرد. هەمو خەڵکان، پاشەکشێیان بەدوژمنانیان دەکرد و ئێوە چاوەڕوانی کەسانێکن بۆ ئێوە شەڕ بکەن.

شایەتی دەدەم ئێوە نمونەیەکی باش بۆ خەڵکی عەرەب نەژادی خۆتان نەبون. ئەوان هەستان و ئەو لەگەڵیان هەستا و پاشەکشێیان بەو کەسانە کرد کەروبەرویان ببونەوە. کاتێك ئێرانیەکان بینیان خەڵك و فیلەکان لەبەنی ئەسەد چیان بەسەر دێت، بەو دەستە لەسوپای ئێران کەروبەرویان ببونەوە، هێرشیان کردنە سەر و جالینوس و برۆ بەستراو لەناو ئەواندا بون. موسوڵمانان چاوەڕوانی چوارەم تەکبیری سەعدیان دەکرد. موسوڵمانان هێرشیان کردە سەریان و لەم کاتەدا ئاشی شەڕ لەسەر بەنی ئەسەد دەسوڕا. فیلەکان لەباڵی راست و چەپ هێرشیان کرد و ئەسپەکانی ئەمان رەمیان کرد.

سەعد بۆ عاصم کوڕی عەمرۆ تەمیمی پەیامی نارد کە: ئەی دەستەی تەمیمیەکان، ئایا هیچ رێگەیەك بۆ روبەروبونەوەی ئەم فیلانە دەزانن؟ وتیان: بەڵێ بەخوا. دواتر عاصم لەناو خەڵکانێك لەتیرهاوێژەکانی خۆی و کەسانێتر کەزیاتر شارەزای شەڕ بون، جاریدا و وتی: ئەی دەستەی تیرهاوێژەکان، فیل سوارەکان لەسەر فیلەکان بکەنە نیشانە. دوبارە وتی: ئەی هەڵگرانی زانستەکانی شەڕ، لەپشتەوە هێرش بکەنە سەر فیلەکان و کۆپان و بەند و ساز وبەرگی ئەوان لەت لەت بکەن. ئەو هات و بەپاسەوانی کردنی ئەوان سەرقاڵ بو و لەم کاتەدا ئاشی شەڕ لەسەر بەنی ئەسەد دەسوڕا. باڵەکانی چەپ و راست بەدوریەکی نەزۆر هێرشیان هێنابو. هاوەڵانی عاصم هێرشیان کردە سەر فیلەکان و دواوەی کەژاوەکەی ئەوانیان گرت و بەندەکانیان لەت لەت کرد. هاواری فیلەکان بۆ ئاسمان بەرز بویەوە و هیچ فیلێك نەما مەگەر ئەوەی بۆ دواوە هەڵات و فیل سوارەکان کوژران و باری سەر شانی بەنی ئەسەد سوك و پاشەکشێیان بەئێرانیەکان کرد. شەڕ تا ئاوا بونی خۆر درێژەی کێشا و لەئاوا بونی خۆر تا بەشێکیش لەشەو بەردەوام بو.

دواتر هەردولای شەڕ پاشەکشێان کرد و لەو ئێوارێدا پێنسەد پیاوی شەڕکەر لەبەنی ئەسەد کوژران. ئەوان پشتیوانی خەڵك بون. ئەمە یەکەم شەڕ بو کەبەشەڕی ئەرماس ناویان برد. عەمرۆ کوڕی شەئسی ئەسەدی سەبارەت بەم شەڕە وتی:

| | |
|---|---|
| جلبنا الخيل من اكناف نيق | الى كسرى فوافقها رعالا |
| تركن لهم على الاقسام شجوا | و بالحقوين اياما طوالا |
| فتلنا رستما و بنيه قسرا | تثير الخيل فوقهم الهيالا |

یانی: سوارەکانمان لەهەر لایەکی بەرزایی کوێستانەکان بۆ سەر خوسرەو کۆکردەوە و

ئەو ئەوانی بەپێشڕەوانی بوێر بینی. ئەسپە شەڕكەرە بەئەزمونەكانی ئێمە خەمیان لەناو جەرگ بەجێهێشت و لەهەردو خاڵیگە چەندین ڕۆژی درێژیان بۆ پرسە دانا. ڕۆستەم و منالەكانیمان لەشەڕدا كوشت بەشێوەیەك ئەسپەكان لەدەوروبەری ئەوان تەپ و تۆزیان دەكرد.

سەعد لەگەڵ سەلما هاوسەری موسەنا كوڕی حارسەی شەیبانی پەیوەندی هاوسەری بەستبو و لە شەراف كردبویە هاوسەری خۆی. كاتێك خەڵك لەشەڕی ئەرماس كەوتنە جوڵە و سەعد توانای جوڵانی نەبو، لەسەر كۆشكەكی خۆی لەتاو ئازار دەینالآند. كاتێك سەلما بینی ئێرانیەكان چی دەكەن، هاواری كرد: ئەی موسەنا لەكوێیت! ئەمڕۆ بۆسوارەكان موسەنایەك نیە. ئەم قسەی لای پیاوێك كرد كە لەبینی چارەنوسی خۆی و سوپاكەی بێزار ببو. سەعد زللەیەكی لەروخساریدا و وتی: موسەنا لەگەڵ ئەم دەستە شەڕكەرە كەئاشی شەڕ بەسەرسەریدا دەسورێت، دەتوانێت چی بكات؟ (ئاماژەی بەبەنی ئەسەد و عاصمدا). ژن وتی: ئایا لەروی غیرەت و ترسەنۆكیە؟ سەعد وتی: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ كەدەرد و ئازاری من دەبینی، لەمن خۆش نەبیت، هیچ كەس لەمن خۆش نابێت. خەڵك پشتی ژنەكەیان گرت و لەبەرژەوەندی ئەو سەعد دەستیان بەقسە كردن كرد لەگەڵ ئەوەی نەترسەنۆك بو و نەشیاوی سەركۆنە كردن.

## شەڕی ئەغواس

كاتێك بەرەبەیان گەیشت، سەعد چەندین كەسی دیار كرد تا كوژراوەكان وبریندار ان بگوازنەوە. برینداره‌كانیان بەژنان سپارد تا پەرەستاریان لێبكەن. كوژراوەكان لەسەرەوەی (موشەرەق)(دۆڵێك لەنێوان عوزەیب و عەین شەمس) بەخاك سپارد. كاتێك سەعد كوژراوەكان و برینداره‌كانی گواستەوە، ناوچاوانی ئەسپە هاتوەكان لەشامەوە دیاركەوتن. گرتنی دەمەشق پێش شەڕی قادسیە بو. كاتێك نامەی عومەر بەئەبو عوبەیدەی جەراح گەیشت تا عێراقیەكان ڕەوانە بكات، ئەوانی بەفەرماندەیی هاشم كوڕی عوتەبە كوڕی ئەبی وەقاص ڕەوانە كرد. فەرماندەی پێشەنگەكان قەعقاع كوڕی عەمرۆ تەمیمی بو. قەعقاع پەلەی كرد بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە یانی ڕۆژی شەڕی ئەغواس گەیشتە لای خەڵك. پێشنیاری كردبو بۆ دەستە دەكەسیەكان دابەش ببن. هەر

دە پیاوێکی شەڕکەر کە بەنیشانەی دیدەوان دەگەیشتن، دەپیاوی شەڕکەری دیکەیان ڕەوانە دەکرد. هاوەڵانی ئەو دەدە گەیشتن. ئەو هاتە لای خەڵك و سڵاوی لێکرد و مژدەی گەیشتنی سوپای پێدان و بۆ شەڕێکی پیاوانە و بوێرانە هانیدان. وتی: کارێك بکەن کەمن دەیکەم. داوای شەڕکەری کرد و سەبارەت بەو قسەی ئەبوبەکریان وت. سوپایەك کە پاڵەوانێکی ئاوا گەورەی تیا بێت. برۆ بەستراو ڕوبەڕوی بویەوە. قەعقاع ئەوی ناسیەوە و هاواری کرد: ئای ئەو کەسانەی داوای خوێنی ئەبوعوبەیدە و سەلیت و کوژراوانی سەرپرد دەکەن! ئەو دوانە شەڕیان دەست پێکرد. قەعقاع ئەوی کوشت و سوارەکانی شەو دەستە دەستە دەگەیشتن و گیان و وزەیان بەخەڵك دەبەخشی. وەك بڵێی دوێنێ پرسەیان نەگێراوە. ئەوان لەکوژرانی برۆ بەستراو خۆشحاڵ بون و ئێرانیەکان دڵ شکاو.

دوبارە قەعقاع داوای شەڕکەری کرد و فیروزان و بەندوان ڕوبەڕوی بونەوە. حارس کوڕی زەبیان کوڕی حارس یەکێك لەپیاوە شەڕکەرەکانی بەنی تیم اللات پەیوەستی قەعقاع بو. شەڕکەران پەلاماری یەکیاندا. قەعقاع فیروزانی کوشت و حارس بەنداون. قەعقاع هاواری کرد: ئەی دەستەی موسوڵمانان، بەشمشێرە هەڵکێشراوەکان هێرش بکەن چونکە دەتوانن خەڵك بەشمشێر دروێنە بکەن. هەردو لای شەڕکەر تا ئێوارێ شەڕیان کرد. خەڵکی ئێران شتێکی شیاوی دەست خۆشی کردن و بەکەڵکیان نەبینی و موسوڵمانان ژومارەیەکی زۆر لەوانیان کوشتار کرد. لەم ڕۆژەدا فیلە شەڕکەرەکان شەڕیان نەکرد چونکە کورتان و بەندەکانی ئەوان دوێنێ لەت لەت ببو و کەژاوەکانیان تێکشکا بو. لەبەر ئەمە دەستیان بەدروست کردنەوەی ئەوان کرد و تا ڕۆژی دواتر نەیانتوانی کۆتایی پێبێنن.

هەرجار کەدەستەیەك لەهاوەڵانی قەعقاع دەگەیشتن، تەکبیری دەوت و موسوڵمانان تەکبیریان دەوت. ئەو هێرشی دەبرد و موسوڵمانان هێرشیان دەبرد. منداڵەکانی مامی قەعقاع دەدە سوار لەسەر وشتر هێرشیان برد. وشترەکان بەپۆششی جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگ داپۆشرا و ڕازاوە بون. قەعقاع فەرمانی بەواندا وشترەکان هاوشێوەی فیلی ئێرانیەکان هێرش بکەنە سەر ئەسپەکان. ئەمڕۆ، ڕۆژی شەڕی ئەغواس کارێکیان کرد کەئێرانیەکان لەڕۆژی شەڕی ئەرماس کردیان. ئەسپی ئێرانیەکان ڕەمیان کرد و ئەسپی

موسوڵمانەکان بەسەریاندا زاڵبون. کاتێك خەڵك ئەمەیان بینی، بەوشێوەیە کرداریان کرد و ئێرانیەکان زیاتر لەوشترەکان زیانیان بەرکەوت تا موسوڵمانان لەفیلەکان.

یەکیتر لەپیاوانی تەمیم هێرشی کردە سەر رۆستەم تا بیکوژێت بەلام پێش گەیشتن بەرۆستەم کوژرا. پیاوێك لەئێرانیەکان هاتەدەر وداوای شەرکەری کرد و ئەعرەف کوری ئەعلەمی عەقیلی روبەروی بویەوە و کوشتی. دواتر یەکیتر داوای هات و کوژرا. چەندین سوار لەوان گەمارۆیاندا و خستیانە سەر زەوی و کەل و پەلی شەریان لێسەند. ئەو خاك و خۆڵی بەسەر و روخساری ئەواندا پرژاند و خۆی بەهاوەلانی گەیاند. لەم رۆژەدا قەعقاع کوری عەمرۆ سی جار هێرشی برد. هەرجار کەدەستەیەك دەردەکەوت، هێرشی دەبرد و بەسەریدا زاڵ دەبو و شەرکەرانی کوشتار دەکرد. دوایین کەسیان بۆزرگمێهری هەمەدانی بو. ئەعور کوری قوتبە پەلاماری شەهریاری سیستانی دا و هەرکامیان خوێنی ئەویتری رژاند. سوارەکان لەهەردولا تا نیمەرۆ شەریان کرد. کاتێك رۆژ گەیشتە نیوە، شەر بوبەکۆمەڵ و تا نیوە شەو شەریان کرد. شەوی شەریان بەئەرماس (نارام شەو) ناو برد و شەوی شەری ئەغواسیان بە(تاریکی). موسوڵمانان لەشەری ئەغواس یەك لەدوای یەك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. لەم رۆژەدا زۆربەی سەردارەکانی ئەوانیان کوشت. سەردارەکانی دڵی سوپا کەوتنە جموجۆڵ و پیادەکان بەبەهێزی لەشوێنی خۆیان مانەوە. ئەگەر سوارەکان ئەگەرابونەوە، رۆستەمیان بەئاسانی گەمارۆدا بو. خەڵك بەهەمان شێوە شەویان کردە رۆژ کەشەوی ئەرماسیان کردە رۆژ. موسوڵمانان بەردەوام شێعریان دەخوێند و بیری ئەژاد و خوێن و بنەماڵەی خۆیان دەکردەوە و شانازیان پێدەکرد. کاتێك سەعد ئەمەی بیست، بەیەکێك لەکەسەکانی لای خۆی وت: ئەگەر خەڵك بەردەوام شانازی بەبنەماڵەکانی خۆیانەوە بکەن، من بەئاگا مەهێنەرەوە چونکە زۆر بەهێزن و ئەگەر بێدەنگ بون و کەسانی دیکە شانازیان نەکرد، بەئاگام مەهێنەرەوە چونکە بەرابەرن و ئەگەر بیستت تەنیا ئەوان شانازی دەکەن، بەئاگام بێنەرەوە چونکە شانازی کردنیان لەسەر خراپەیە.

کاتێك شەر روی لەسەختی کرد و ئەبو مەحجەن کەلەکۆشکدا زیندانی بو، بەسەلما هاوسەری سەعدی وت: ئایا رازی نابیت بەرەلام بکەیت و ئەسپی (بەلقا ) بەقەرز

بدەیتە من؟ پەیمانی خوا لەئەستۆی مندایە کەئەگەر تەندروست مامەوە، بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە و پێ دەخەمە ناو بەندی تۆ. سەلما رازی نەبو و ئەبومحجەن وتی:

كفى حزنا ان تردى الخيل بالقنا و اترك مشدودا على و ثاقيا

اذ قمت عنانى الحديد و اغلقت مصاريع دونى قد تصم المناديا

وقد كنت ذا مال كثير و اخوة فقد تركونى واحدا لا اخا ليا

و لله عهد لا اخيس بعهده لئن فرجت ان لا ازور الحوانيا

یانی: ئەم ئەندازەیە خەم بۆ من بەسە کەسوارەکان ڕم هەڵدەگرن و شەڕ تاقی دەکەنەوە و من بەستراوم و بەند لەپێمدا. کاتێك هەستم، ئاسن هیلاکم دەکات و درگاکانی زیندان بەرومدا دەبەسترێن کەهەمو جاردەرێك لاڵ دەکات، چونکە ئەو شتەی بێ گومان بەهیچ شوێنێك ناگات دەنگی ئەوە. من سامانی فراوان و برای زۆرم هەبو و ئێستا منیان بەتەنیا جێهێشتوە و بێ کەس. پەیمانی خوا لەئەستۆی مندایە کەنایشکێنم کەئەگەر بەندی من بکەنەوە، هیچ کات سەر لەمەیخانەکان نادەم.

سەلما بەزەیی پێدا هاتەوە و ئەوی ئازاد کرد و بەلقا ئەسپەکەی سەعدی پێدا. سوار ئەسپەکە بو و کاتێك گەیشتە لای باڵی راست، تەکبیری وت و هێرشی کردە سەر باڵی راستی ئێرانیەکان. ئەو خەڵکی بەشێوەیەکی مەترسیدار دەکوشت. خەڵك سەریان سورما بەڵام ئەویان نەدەناسی. یەکێك وتی: لەهاوەڵانی هاشم یا خودی هاشمە. سەعد وتی: ئەگەر ئەبو محجەن زیندانی نەدەبو، دەموت ئەمە ئەبو محجەن و ئەمەیش بەلقا یە. دەستەیەك لەخەڵك وتیان: خزرە. کەسانی دیکە وتیان: ئەگەر جگە لەمەدەبو کەفریشتەکان شەڕ ناکەن، دەمانوت: ئەمە فریشتەیەکە. کاتێك شەو بەنیوە گەیشت و موسوڵمان و ئێرانیەکان دەستیان لەشەڕ هەڵگرت، ئەبومحجەن گەڕایەوە و رۆشتە ناو کۆشك و پێی خستەوە ناوبەند و وتی:

لقد علمت ثقيف غير فخر بانا نحن اكرمهم سيوفا

و اكثرهم دروها سابغات و اصبرهم اذا كرهوا الوقوفا

و انا و فدهم فى كل يوم فان عموا فسل بهم عريفا

و ليلة قادس لم يشعروا بى و لم اشعر بمخرجى الزحوفا

فان احبس فذلكم بلائى و ان اترك اذيقهم الحتوفا

یانی: سەقیفیەکان دەزانن ( و ئەمە لەبەر شانازی کردن بەخۆ نیە) کەئێمە لەناو ئەوان رێزدارترین شمشێرەکانین. زیاتر لەهەموی ئەوان زرێ سەراسەر پۆشەکانمان هەیە و کاتێك هەموان بەشداری کردن لەگۆڕەپانی شەڕیان لا ناخۆشە، لەهەموان خۆڕاگرترین. ئێمە نوێنەری ئەوان لەهەمو شەڕەکانین، ئەگەر نەناسراو بمێننەوە، لەخەڵك ناس سەبارەت بەوان پرسیار بکە. لەشەوی شەڕی قادسیە لەبونی من ئاگادار نەبونەوە و من شەڕکەرانم لەهاتنەدەرم ئاگادار نەکردوە. ئەگەر من زیندانی بکەن، ئەمە هۆکاری تاقی کردنەوەی منە و ئەگەر ئازادم بکەن، تامی مەرگیان پێ دەچێژم.

سەلما وتی: بۆچی ئەو تۆی زیندانی کردوە؟ ئەبو محجەن وتی: سوێند بەخوا منی لەسەر نارەوایەك زیندانی کردوە کەخورادبێتمەوە. من پیاوێکم لەرۆژگاری جاهلی زۆرم شەراب دەخواردەوە، پیاوێکی وتاردەرم کەشێعر و هۆنراوەکان دێنە سەر زمانم. لەوانە، وتم:

| | |
|---|---|
| اذ امت فادفنی الی اصل کرمة | تروی عظامی بعدموتی عروقها |
| و لا تدفننی بالفلاة فاننی | اخاف اذا مامت ان لا اذوقها |

یانی: کاتێك بمرم، لە بن رەزێکدا بەخاکم بسپێرە تا ریشەکانی ئێسقانەکانم لەبادە شادمانم بکەن. من لەبیابان بەخاك مەسپێرە، دەترسم ئەگەر بمرم، تامەکەی نەچێژم.

لەبەر ئەوە منی زیندانی کرد چونکە ئەم شێعرانەم وت. کاتێك بەیانی بویەوە، ئەو مانگ روخسارە کەلەسەعد تورە ببو، هاتەلای و ئاشتی لەگەڵدا کرد و بەسەرهاتەکەی ئەبومحجەنی بۆ گێرایەوە. سەعد ئەوی ئازاد کرد و وتی: برۆ و لەسەر قسەیەك زیندانیت ناکەم تا ئەنجامی نەدەیت. ئەبو محجەن وتی: بەمشێوەیە، سوێند بەخوا ئیتر شوێن وتەکانی خۆم ناکەوم و هەرگیز بەکارێکی قێزەون خۆم ناشیرین ناکەم.

## شەڕی عماس

دواتر سێیەم رۆژییان بەبەرەبەیانی گەیاند و هەردولای شەڕکەر لەشوێنەکانی خۆیاندا بون. لەناو دوریزەکە، لەکوژراوانی وبریندارانی موسوڵمانان دوهەزار کەس و لەئێرانیەکان دەهەزار کەس. موسوڵمانان کوژراوەکانی خۆیان بەرەو ئارامگاکان دەبرد و بریندارەکانیان دەبردە لای ژنان. ژنان و منالآن گۆڕیان هەڵدەکەند و سەرپەرەستی

کاروباری کوژراوەکان حاجب کوڕی زەید بو. بەڵام کوژراوی ئێرانیەکان بەهەمان شێوە لەناو گۆڕەپانەکەدا بون و کەس ئەوانی نەگواستەوە و ئەمەیش یەکێك بو لەو هوکارانەی وزە و بوێری بەموسوڵمانەکان بەخشی. قەعقاع ئەو شەوە تا بەیانی بەئاگا مایەوە و هاوەڵانی خۆی دەستە دەستە بۆئەو شوێنانەی لەیەك جیا ببونەوە، رەوانە کرد. وتی: کاتێك خۆر هەڵبێت، سەد سەد وەرن، ئەگەر هاشم هات چ باشتر و گەرنە کارەکانی پێشتر سەر لەنوێ ئەنجام بدەنەوە بەو هیوایەی سەرکەون و بەمشێوەیە هیچ کەس لێی ئاگادار نەبێت. خەڵك لەسەر شوێنەکانی خۆیان شەویان کردە رۆژ. کاتێك خۆر تیشکی زێری سپی بەسەر جیهاندا پرژاند، هاوڵانی قەعقاع گەیشتن. کاتێك ئەوانی بینی، تەکبیری وت و موسوڵمانان تەکبیریان وت و بۆ پێشەوە هاتن و هێزە شەڕکەرەکان بون بەچەندین دەستە و بەهەمو کەل و پەلەکانی شەڕ لەیەکیان کوشت. هێزە یارمەتیدەرەکان یەك لەدوای یەك دەگەیشتن. هێشتا دوایین کەس لەهاوەڵانی قەعقاع نەگەیشتبو کەهاشم هاتە لای ئەوان. ئەویان لەکارەکانی قەعقاع ئاگادار کردەوە. ئەو شەڕکەرانی خۆی لەدەستەی حەفتاکەسیدا رێکخست. لەناو ئەوان قەیس کوڕی هوبەیرە کوڕی عەبد یەغوس ناسراو بەقەیس کوڕی مەکشوحی موراد‌ی بو. ئەو لەپیاوە بەئەزمونەکان لەشەڕەکانی عەرەبی و ئیسلامی هەژمار نەدەکرا و تەنیا لەشەڕی یەرموك بەشداری کردبو. ئەو بۆ شەڕ کردن لای هاشم وەستا. کاتێك دودڵی سوپا روبەروی یەك بونەوە، تەکبیری وت و موسوڵمانان تەکبیریان وت. وتی: یەکەم کار لەشەڕ، رۆشتن بۆ پێشەوەیە و دواتر لەئەستۆی تیرهاوێژەکانە. ئەو هێرشی کردە سەر ئێرانیەکان و کوشتاری کردن و ریزەکانی ئەوانی تا عەتیق بڕی و گەڕایەوە.

ئێرانیەکان شەویان تا بەیانی بەسەر لەنوێ دروست کردنەوەی کۆپانی فیلەکان و ئامادەکردنەوەی کەژاوەکانیان بەسەر برد و دواتر لەشوێنەکانی خۆیان ریزیان بەست. پیادەکان لەگەڵ فیلەکان هاتن و پارێزگاریان لێدەکردن تا بەند و کۆپانەکانیان وەك جاری پێشو لەت لەت نەکرێت. چەندین سوار پشتیوانیان لەپیادەکان دەکرد. ئەسپیەکان وەك رۆژی پێشتر رەمیان نەکرد چونکە فیلەکان کاتێك تەنیا بن زیاتر مەترسیدارن و کاتێك دەوریان بگیرێت، ئارامتر و دەستەمۆ ترن. شەڕی عماس لەسەرەتاوە تا کۆتایی سەخت و دژوار بو و عەرەب و ئێرانی تیایدا بەرابەر. هیچ

روداوێك روی نەدەدا مەگەر ئەوەی بەئاواز بەیەزدگێردیان دەگەیاند و ئەو پیاوانی شەڕکەر و بەهێزی خۆی، یەك لەدوای یەك رەوانە دەكرد. ئەگەر بەو شێوە نەدەبو كەخوا خستیە دڵی قەعقاع كەلەم رۆژەدا چی بكات، موسوڵمانان شكەستیان دەخوارد.

قەیس كوڕی مەكشوح كەلەگەڵ هاشم هاتبو، بەو پەڕی هێزەوە شەڕی كرد و هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕێكی پیاوانە هاندا. عەمرۆ كوڕی مەعدی كەرب وتی: من هێرش دەكەمە سەر فیلەكان و دەوروبەریان (یەكێك لەفیلەكانی نیشاندا) من زیاتر لەو كاتەی قوربانیەك سەر دەبڕن، زیاتر بەجێ مەهێڵن. ئەگەر لەهاوكاری كردنی من درەنگ بكەن، منتان لەدەست داوە و لەكوێ دەتوانن وەك منێك بەدەست بێنن. ئەو هێرشی برد و لەقولایی ئەواندا رۆیشتە پێش و تەپ و تۆز ئەوی داپۆشی. هاورێكانی هێرشیان برد و ئێرانیەكان دوای ئەوەی ئەویان خستبوە سەر زەوی، لەدەوری ئەو بلاوەیان لێكرد. شمشێر لەدەستیدابو و شەڕی دەكرد. لەئەسپەكەیان دابو و كوشتبویان. ئەو قاچی ئەسپێكی ئێرانی گرت و ئەسپەكە نەیتوانی لەشوێنی خۆی بجولێت. سوارەی ئەسپەكە دابەزی وبۆ لای هاوەڵانی خۆی رایكرد و عەمرۆ سوار ئەسپەكە بو. پیاوێكی ئێرانی هاتەدەر و یەكێك لەموسوڵمانان بەناوی شەبر كوڕی عەلقەمەی كورتەبالا روبەروی بویەوە. پیاوی ئێرانی لەئەسپەكەی دابەزی و ئاهەنگی ئەوی كرد و دای بەزەویدا و لەسەر سنگی دانیشت و دواتر شمشێرەكەی لەكالان دەرهێنا تا بیكوژێت. كاتێك شمشێرەكەی دەركێشا، ئەسپەكەی رەمی كرد و هەوسارەكە، ئەوی بۆ دواوە برد و پیاوی عەرەب ئەوی گرت و سەری بڕی و كەل و پەل و كەرستەی شەری پیاوی ئێرانی هەڵگرت و بەدوانزە هەزار درەم فرۆشتی.

كاتێك سەعد فیلەكانی بینی لەناو دەستە شەڕكەرەكان بلاوبونەتەوە و كاری پێشوی خۆیان دەكەن، پەیامی بۆ لای قەعقاع و عاصم و كوڕانی عەمرۆ نارد كە: زیانی فیلەكان لەمن دوربخەنەوە. بەحەمال و رەبیلی وت: زیانی فیلەكە لەمن دوربخەنەوە. ئەو فیلە لەبەرابەر ئەم دوانە بو. قەعقاع و عاصم دوڕمیان هەڵگرت و لەگەڵ سوارەكان و پیادەكان بۆ پێشەوە رۆیشتن. حەمال و رەبیل كاری ئەوانیان ئەنجامدا. قەعقاع و عاصم بۆ پێشەوە رۆیشتن و رمەكانی خۆیان لەچاوی فیلە سپیەكەدا چەقاند. فیل بەتوندی سەری تەكاندا و فیل سوارەكەی خستەخوار و لوتی خۆی بەرز كردەوە. ئەوان

فیل سوارەکانیان کوشتار کرد. حەمال و رەبیلی ئەسەدی هێرشیان کردە سەر فیلێکی تر. حەمال رمی لەچاوەکانی چەقاند کەکەوتە سەر زەوی و دوبارە هەستایەوە. رەبیل لێدا و لوتی قرتاند. فیل سوارەکە ئەوی بینی و لوت وناوچاوی بەتەور قەڵشت. رەبیل بریندار خۆی رزگار کرد و فیل بریندار و سەرگەردان لەناو دو ریزەکەدا مایەوە. هەرجار کەریزی موسوڵمانان لەوێ تێپەری دەکرد، فیلەکەیان دەخست و هەر جار ریزی ئێرانیەکان لەوێوە تێدەپەڕی، فیلەکەیان هەڵدەستاند. فیل بۆ دواوە رایکرد. بە گوڕ بانگیان دەکرد. حەمال هەردوچاوی ئەوی کوێر کردبو. فیل خۆی خستە ناو عەتیق و فیلەکانی دیکە شوێنی کەوتن و ریزی ئێرانیەکانیان تێك وپێکدا و بەدوای ئەودا رۆشتن تا بەکەژاوەکانی خۆیان بۆ مەداین گەڕانەوە و فیل سوارەکان هەمویان لەناو چون. کاتێك فیلەکان رۆشتن و موسوڵمانەکان لەزیانی ئەوان رزگاریان بو و ئێرانیەکان ئەوانیان لەدەستدا، موسوڵمانەکان بەکۆمەڵ هێرشیان کرد و چالاکیان لەخۆیان نیشاندا تا ئەوەی رۆژیان گەیاندە شەو، شەڕێکی قورس رویدا و هەردو لای شەڕکەر خۆراگریان کرد و بەرابەر هاتنەدەر.

## شەوی هەریر و کوژرانی رۆستەم

دەڵێن: بۆیە بەم شەوە دەڵێن شەوی هەریر چونکە پیاوە شەڕکەرەکان لێویان بۆ قسە کردن نەکردەوە بەڵکو هاواریان کرد و زوزاندیان و هەریر بەمانای زوزمیە. سەعد عەمرۆ و توڵەیحەی لەشەوی هەریر بۆ خوارەوەی ئاوەکە بۆ لای بەشی خواروی سوپاکە نارد تا لەوێ بن ئەکا ئێرانیەکان لەوێوە هێرش بکەنە سەر عەرەبەکان. کاتێك ئەم دوانە گەیشتن، توڵەیحە وتی: باشترە لێرەوە هێرش بکەینە سەر ئێرانیەکان. عەمرۆ وتی: نا لەخوارەوترەوە بڕۆین. لێك جیابونەوە و توڵەیحە لەپشتی سوپای ئێران هات و سێ جار تەکبیری وت و درێژەی بەرێگای خۆیدا. خەڵکی ئێران ترسان و موسوڵمانان سەریان سوڕما. ئێرانیەکان بەدوایدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزیەوە.

بەڵام عەمرۆ لەخوارەوە هێرشی کردە و گەڕایەوە. ئەم کەسانەیش هاتنەدەر: مەسعود کوڕی مالکی ئەسەدی، عاصم کوڕی عەمرۆ، کوڕی زی بوردەینی هیلالی، کوڕی زی سەهمەین، قەیس کوڕی هوبەیرەی ئەسەدی و کەسانیتر. ئەوان شوێن ئەو خەڵکە

کەوتن و بەدوایاندا ڕۆشتن. ئێرانیەکان موسوڵمانەکانیان بینی نایانەوێت ئامادەیی تەواو بۆ شەڕ بەدەست بێنن بەڵکو تەنیا دەیانەوێت پێشڕەوی بکەن. ئەوان ریزەکانی خۆیان بردە پێشەوە و خەڵك لەپێشڕەوی پێشیان کەوتن و ئەم کارەیان بەفەرمانی سەعد کرد. یەکەم کەس لەپێشڕەوی پێش ئەوان کەوتەوە، قەعقاع بو. سەعد وتی: ئەی خوایە، ئەم کارە بەو ببەخشە و سەرکەوتوی بکە چونکە من فەرمانم بەوداوە هەرچەندە گوێی لەفەرمانی من نەگرت. دواتر وتی: دەبینم بارودۆخ بەمشێوەیە دەسوڕێت! کاتێك سێ جار تەکبیرم وت هێرش ببەن. جارێك تەکبیری وت و ئەسەدیەکان پەیوەستیان بون. سەعد وتی: ئەی خوایە ئەمە بەوان ببەخشە و سەرکەوتویان بکە. دواتر خەڵکی بوجەیلە هێرشیان برد و ئاشی شەڕ لەسەر سەری قەعقاع دەسوڕا. حەنزەلە کوڕی ڕەبیع و فەرماندەی دەستە دەکەسیەکان و تولەیحە و غالب و مالك وپیاوە بەئەزمونەکانی دیکە پێشڕەویان کرد. کاتێك بۆ جاری سێیەم تەکبیری وت، خەڵك پەیوەستی یەکتر بون و ڕوبەڕوی سوپای بەرامبەری خۆیان بونەوە و دوای ئەوەی نوێژی خەوتنانیان کرد، پێشوازیان لەشەو کرد. دەنگی شمشێرەکان تابەرەبەیان بەشێوەیەك بەردەوام بو وەك ئاسن کوتی ئاسنگەران. خواوەند هەمویانی بەجل و بەرگی خۆڕاگری وبەهێزی داپۆشی. سەعد شەوێکی وای کردە ڕۆژ کەهیچ کات شەوێکی بەو دژواریەی نەدیبو. عەرەب وئێرانی شتێکیان بینی هاوتایان نەبینیبو. هەواڵ و بەسەرهاتەکان بەرۆستەم و سەعد نەدەگەیشتن. سە عد لەخوا پاڕایەوە. کاتێك بەرەبەیان هات، خەڵك ناو و نەژادی خۆیان دەوت و لێرەوە زانرا کامانە لەپێشەکانن. یەکەم شتێك لەنیوەی کۆتایی شەو بیستی، دەنگی قەعقاع کوڕی عەمرۆ بو کەدەیوت:

نحن قتلنا معشرا و زائدا      اربعة و خمسة و واحدا

نحسب فوق اللبلد الا ساودا      حتی اذا ماتوا دعوت جاهدا

الله ربی و احترزت عامدا

یانی: ئێمە گروپ گروپ و دەستە دەستەمان لەوان کوشتار کرد. چواریەکان و پێنجیەکان و یەکیەکانمان کوشت. بەلەپێشتر لەشێران و دڕندەکان هەژمار دەکرێین. خوا، خواوەندی منە و من لەخواستە پێشینەکانم خۆم بەدور گرت.

کەندیەکان تورکی تەبەریان کوشت کە لەشەڕکەرە گەورەکانی ئەوان بو.

خەڵك شەوی زوزەیان گەیاندە بەیانی (شەوی قادسیە لەم شەوانە هەژمار دەکرا)هەمویان بەتەواوی هیلاك بون چونکە سەراسەری شەو چاویان لێك نەنابو. قەعقاع لەناو خەڵکەکەی خۆی رەوانە بو و وتی: کەمێکیتر ئاشی شەڕ لەبەرژەوەندی کەسێکدا دەسورێت کەپێشەنگی شەڕ لەگەڵ دوژمن بێت. کاتژمێرێك بحەوێنەوە و دواتر هێرش ببەن چونکە پایەداری و سەرکەوتن دو هاورێی یەکترین. دەستەیەك لەفەرماندەکانی سوپا لەدەوری کۆبونەوە و لەبەرابەر رۆستەم خۆڕاگریان کرد تا لەکاتی بەرەبەیان لەگەڵ ئەو کەسانەی لای ئەوبون، شەڕیان دەست پێکرد. سەرکردەکانیان لەناویان هەستان و وتیان: نابێت ئەوان لەرێگەی خوا لەئێوە تێکۆشەرتربن، هەروەها ئێرانیەکان نابێت بۆ رۆیشتن بەرەو مەرگ لەئێوە زیاتر پەلەیان بێت. ئەوان هێرشیان کردە سەر ئەو سوپایە لەدوژمن کەنزیکیان بون و روبەروی شەڕکەران بونەوە و تا کاتی نیمەڕۆ شەڕیان کرد. یەکەم کەسەکان کەلەناو چون، فیروزان و هورموزان بون کەشەڕیان کرد و خۆڕاگریان کرد تا کوژران. دڵی سوپای دوژمن کەڵێنی تێکەوت. تەپ و تۆزی گۆڕەپان دامرکایەوە و گێژەڵوکە بەسەر ئەواندا هەڵیکرد. ئەم بایان بە(دەبور) بای رۆژئاوا ناودەبرد، ڕەشەبا، خێوەتەکەی رۆستەمی هەڵکەند و خستیە ناو عەتیقەوە. ڕەشەبا بەسەختی هێرشی کردە سەر ئێرانیەکان و یەکیەکی ئەوانی خستە سەرزەوی. قەعقاع و هاورێکانی گەشتنە لای تەختەکەی رۆستەم و بینیان رۆستەم دوای هەڵکەنرانی خێوەتەکەی بەهۆی ڕەشەباوە، لەشوێنەکەی هەستاوە و دەیەوێت سوار ئەو ئێسترانە بێت کەهاورێ لەگەڵ سامانەکان بۆ ئەویان هێنابو. ئەو لەسێبەری ئێسترێکی بارقورسدا حەسابویەوە. هیلال کوڕی عەلەفە شمشێری لەو بارەدا کەرۆستەم لەژێریدا بو و پەتەکانی قرتاند. یەك دوتا بار بەر پشتی رۆستەم کەوت و مۆرەکانی پشتی هاری. هیلال شمشێری لەو بارەدا کەبۆنێکی خۆش بڵاو بویەوە. رۆستەم بەرەو عەتیق ڕۆشت و خۆی خستە ناو عەتیق. هیلال شوێنی کەوت و پەلاماریدا و هەردوقاچی گرت و دەریهێنا و شمشێری لەناوچاوی دا و کوشتی. دواتر خستیە ژێر سمی ئێسترەکان و رۆشتە سەر تەختەکەی و هاواری کرد: سوێند بەخواوەندی کەعبە رۆستەمم کوشت! وەرن! وەرن! خەڵك دەوریان گرت و تەکبیریان وت. سەعد هەمو کەل و پەل و کەرەستەکانی شەڕی رۆستەمی بەبکوژەکەی یانی هیلال کوڕی عەلەفە بەخشی. ئاو،

ئەوی داپۆشیبو و لەبەر ئەمە کلاوەکەی نەدۆزیەوە چونکە بەهای کلاوەکەی سەد هەزار دینار بو.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك هیلال ئاهەنگی رۆستەمی کرد، رۆستەم تیرێکی بۆ هاویشت و قاچی بەشوێن پێی ئەسپەکەیەوە دوری. هیلال هێرشی کردە سەر و بەشمشێر لێیدا و کوشتی و دواتر سەری بڕی و بەرزی کردەوە و وتی: رۆستەمم کوشت! لەم کاتەدا دڵی سوپای بتپەرستەکان تێکشکا.

جالینوس لەسەر وێرانەکان وەستا و داوای لەئێرانیەکان کرد تێپەڕن. بەڵام ئەوانەی نزیك بون، پەلەیان کرد و تەماحکاریان لەخۆیان نیشاندا و پەپولە ئاسا رژانە ناو عەتیق و موسوڵمانان بەڕم لێیان دان و هیچ زیندوێك لەوان رزگاری نەبو. ئەوان سی هەزار کەس بون. زەرار کوڕی خەتاب ئاڵای کاویانی، گەورەترین ئاڵای ئێرانیەکانی هەڵگرت کەبە سی هەزار درەم لێیان کڕی. بەهاکەی ملیۆنێك و دوسەد هەزار بو. لەم شەڕەدا دەهەزار کەس لەئێرانیەکان کوژران جگە لەکوژراوانی شەڕەکانی پێشوتر. لەموسوڵمانان پێش شەوی زوزە هەزار وپێنسەد پیاوی شەڕکەر کوژران و لەشەوی هەریر و شەوی قادسیە شەش هەزار کەس. کوژراوەکان لەچاڵێك بەرەو رۆژهەڵات بەخاك سپێردران. کوژراوەکانی پێش شەوی زوزە لەسەر موشەرەق بەخاك سپێردران.

ساز وبەرگ، باروبنەکان، کەل و پەلەکانی شەڕ، کۆکرانەوە و بەرادیەك کۆکرایەوە کەپێشتر بەو ئەندازەیە کۆنەکرابویەوە و دوای ئەوەیش کۆنەکرایەوە. سەعد کەسی بۆ لای هیلال نارد و هەواڵی رۆستەمی لێپرسی. ئەو رۆستەمی بردە لای. سەعد وتی: هەمو شتەکانی هەڵبگرە جگە لەو شتەی دەتەوێت بەجێی بێڵیت. سەعد فەرمانی بەقەعقاع و شورەحبیلدا شوێن هەڵاتوان بکەون. ئەو دوانە ڕۆشتن تاگەشتنە دوریەك بەئەندازەی خەرارە لەقادسیە. زەهرە کوڕی حەویەی تەمیمی بەسێسەد سوار بەدوای ئەواندا ڕۆشت و دواتر خەڵك پەیوەستی بون. ئەو بەتێکشکاوەکان گەیشت کەجالینوس دەیویست کۆیان بکاتەوە. زەهرە ئەوی کوشت و هەمو کەل و پەلەکانی هەڵگرت. ئەوانەی لەنێوان خەرارە تا سیلحین تا نەجەف بون، کوشتاریان کرد و هاورێ لەگەڵ ئەسیرەکان گەڕانەوە. تەنانەت گەنجێکیان بینی لەنەخع کەهەشتا ئەسیری ئێرانی پێش خۆی خستبو.

سەعد سامانی جالینوسی بەزۆر زانی و نەیویست هەموی بەبکوژەکەی ببەخشێت. عومەر بۆ سەعدی نوسی: ئاهەنگی شێرەپیاوێکی وەك زەهرە دەکەیت کەلەرێگای تۆدا ئەو هەمو ئەشکەنجەی بینی و بەو شێوە بوێرانەیە هەوڵیدا لەکاتێکدا چەندین شەڕی مەترسیداری دیکەت لەبەردەمدایە و پێویستت پێیەتی. دەتەوێت دڵی بڕەنجێنیت؟ سامانەکەی جالینوس بەو ببەخشە و لەکاتی بەش کردنی تالآنیەکان پێنسەد درەمی زیاتر لەکەسانی دیکە پێ ببەخشە.

کاتێك موسوڵمانەکان شوێن ئێرانیەکان کەوتن، بارودۆخ بەشێوەیەك گۆڕا کاتێك پیاوێکی موسوڵمان ئیشارەی لەکەسێکی ئێرانی دەکرد، ئێرانی بەپێی خۆی دەهاتە لای و لەسەر دەستی ئەو دەکوژرا. هەندێ کات کەل و پەلی شەڕی ئێرانیەکەی هەڵدەگرت و بەوە دەیکوشت. هەندێ کات دوپیاوی دەبینی و فەرمانی دەدا یەکیان ئەویتریان بکوژێت و دواتر ئەویتریانی سەردەبڕی.

سلێمان کوڕی رەبیعەی باهلی و عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە روبەروی دەستەیەکی ئێرانی بونەوە کەئالآیەکیان هەڵکردبو و دەیانوت: لەشوێنەکەمان هەڵناستین تا دەمرین. سلێمان و هاورێکانی ئەوانیان کوشتار کرد. دوای شکەست، سی و چەند دەستەی شەڕکەر خۆراگریان کردبو، چونکە لەهەلآتن شەرمیان دەکرد. سی و چەند کەس لەموسوڵمانان ئاهەنگی ئەوانیان کرد. بۆ هەر دەستەیەك فەرماندەیەك. شەڕی دەستە شەڕکەرەکانی ئێران بەدو شێوە بو: دەستەیەکیان هەلآتن و دەستەیەکیان خۆراگریان کرد تا کوژران. لەناو دەستەی هەلآتوان هورموزان بو کەروبەروی عەتارد بویەوە و ئەهوەز کە لەبەرابەر حەنزەلە کوڕی رەبیع دەبیری پێغەمبەر(ص) شەڕی دەکرد. هەروەها: زاد کوڕی بوهەیش لەبەرابەر عاصم کوڕی عەمرۆ، قارن لەبەرابەر قەعقاع. لەناو ئەو کەسانەی خۆراگریان کرد و کوژران: شەهریار کوڕی کونارا لەبەرابەر سلێمان کوڕی رەبیعە، کوڕی هیربۆد لەبەرابەر عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە، فەرخان ئەهوازی لەبەرابەر بوسر کوڕی ئەبی رۆهمی جۆهەنی و خوشەدی سوم (یاخوسرەو شەنوم) لەبەرابەر کوڕی هوزەیلی کاهلی.

خەڵك لەشوێن کەوتنی هەلآتوان گەڕانەوە لەکاتێکدا بانگدەری ئەوان کوژرابو. موسوڵمانان لەسەر بانگ وتن شەڕی یەکتریان کرد ئەوەندەی نەمابو یەکتر کوشتار

بکەن. سەعد تیروپشکی هاویشت و تیر بەناوی یەکێك لەوان هاتەدەر و بانگی وت.
ئەوانەی لەقادسیە پیاوانە شەڕیان کردبو و رەنج وئەشکەنجەی زۆریان چێشتبو، لەبەش کردنی تالأنیەکان زیاتریان لەکەسانی دیکەبەرکەوت و پێنسەد پێنسەد زیاتریان وەرگرت. ئەوان بیست وپێنج پیاو بون و زەهرە و عەصمە زەبی و کەلەج لەناو ئەواندا بون. بەلأم شەڕکەرانی رۆژەکانی پێش قادسیە، بۆ ئەوان بەخششێك بەئەندازەی سێ هەزار درەم دیاری کرا و بەمەیش زیاتریان لەشەڕکەرانی قادسیە بەرکەوت. بەعومەریان وت: باشتر دەبو ئەگەر شەڕکەرە تێکۆشەرەکانی قادسیەیشی پەیوەستی ئەوان دەکرد. عومەر وتی: نامەوێت کەسانێك پەیوەستی ئەوان بکەم کە لەگەڵ ئەواندا نەبون. پێیان وت: باشتر دەبو ئەگەر لەپێشی بەو کەسانە بدرایە کەماڵیان دورە و ئەمە لەبەرابەر ئەو کەسانەیە لەناو ماڵەکانی خۆیان شەڕیان لەگەڵ دوژمن کرد. وتی: چۆن ئەوان پێش ئەمان بخەم کەئەمان هۆکاری خەمی دوژمنان بون! بۆ موهاجیرەکان ئەم کارەیان لەگەڵ ئەنسار نەکرد!
عەرەبەکان چاوەڕوانی شەڕی نێوان عەرەب و ئێرانیان لەقادسیە لەنێوان عەدەن ئەبین تا عوزەیب و لەنێوان ئوبوڵە و ئەیلە بون لەسەر بنەمای ئەو گومانەی کەخۆڕاگری یا روخانی ولأتەکەیان لێرەدا دەبێت. لە هەرشارێك بیسەرێك بو چاوەڕوانی بەسەرهاتەکانی شەڕی دەکرد و کۆی دەکردەوە و لێی دەروانی تا بزانێت کۆتایی کارەکە چی دبێت. کاتێك شەڕی قادسیە رویدا، پەریەکان بەسەرهات و هەواڵەکانیان کۆکردەوە و بردیانە لای چەندین کەس لەخەڵك بەلأم هەواڵ و بەسەرهاتی مرۆڤەکان پێش ئەوان کەوتنەوە و زوتر گەیشتن.
سەعد هەواڵی سەرکەوتنەکانی بۆ عومەر نوسی و ئەوی لەژمارەی کوژراو و بریندارەکانی موسوڵمانان ئاگادار کردەوە و ناوی ئەو کەسانەی دەیناسی، بەسەعد کوڕی عومەیلەی فەزاری بۆ لای ئەوی کرد. عومەر لەبەرەبەیانەوە لەکاروانیەکان و هەمو ئەوانەی دەگەیشتن، سەبارەت بەچارەنوسی شەڕکەرانی قادسیە پرسیاری دەکرد تا رۆژ دەگەیشتە نیوە و دواتر دەگەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی. کاتێك مژدەدەر گەیشت، پرسی: لەکوێوە دێیت؟ ئەو هەواڵەکانی پێ راگەیاند. عومەر وتی: ئەی بەندەی خوا ئاگادارم بکەرەوە چی رویدا. وتی: خوا بتپەرستەکانی تێك شکاند. عومەر بەهێواشی

لەگەڵ ئەو رایدەکرد و ئەو سوار وشترەکەی خۆی بو و نەیدەزانی لەگەڵ کێ قسە دەکات. لەم کاتەدا گەشتنە ناو مەدینە و خەڵك هەمویەك یەك رێزیان لێگرت و وتیان: سلاّو لەتۆ ئەی سەرومری خوا پەرستەکان. مژدەدەر وتی: خوا لێت خۆش بێت بۆ پێت نەوتم تۆ گەورەی باوەڕدارانیت! عومەر وتی: براکەم ، تۆ هیچ ترست نەبێت.

موسوڵمانان لەقادسیە مانەوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی مژدەدەریان دەکرد. عومەر فەرمانی بەخەڵکدا سامانەکانی خۆیان هەڵبگرن و کاروباری خۆیان باش بکەن و سوپاییەکان لەشام، لەوانەی لەشەڕی یەرموك و دەمشق ئامادە بون، پەیوەستیان بن. یەکەم کەسان لەوان لەرۆژی شەڕی ئەغواس گەیشتن و دوایین کەسیانی لەبەیانی رۆژی سەرکەوتن. سەبارەت بەوان نامەیان بۆ عومەر نوسی کەدەبێت چ کارێکیان لەگەڵدا بکرێت. نامەیان بەئەزیر کوڕی عەمرۆدا رەوانە کرد.

دەستەیەك دەڵێن: شەڕی قادسیە لەساڵی ٦٣٧/١٦ زایینی رویدا. دەستەیەك لەخەڵکی کوفە وتویانە: لەساڵی ٦٣٦/١٥ زایینی رویدا بەڵام پێشتر ئاماژەمان پێدا کە لەساڵی ٣٦٥/١٤ زایینی رویدا.

## فەرمانڕەوای عوتبە کوڕی غەزەوان لەسەر بەسرە

دەڵێن: لەم ساڵەدا عومەر، عوتبە کوڕی غەزەوانی رەوانەی بەسرە کرد. فەرمانداری ئەوێ قوتبە کوڕی قەتادە سەدوسی بو کەهێرشی دەکردە سەر ئەو پانتاییانە بەهەمان شێوە کەموسەنا لەپانتاییەکانی حیرە هێرشی دەبرد. ئەو نامەی بۆ عومەر نوسی و لەپێگە وجێگەی خۆی ئاگاداری کردەوە و وتی ئەگەر دەستەیەکی کەمی لەگەڵدا بێت دەتوانێت بەسەر دەوروبەری حیرەدا زاڵ بێت وئێرانیەکان تێك بشکێنێت و ئەوان لەوڵاتەکەیان دوربخاتەوە. عومەر نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە و وشیار بێت. ئەو شەریح کوڕی عامر یەکێك لەپیاوانی بەنی سەعد کوڕی بەکری بۆ لای ئەو رەوانە کرد. ئەو بەرەو بەسرە رۆیشت و قوتبەی لەوێ بەجێهێشت و رێگەی ئەهوازی بڕی تا سەرئەنجام لەدارس دابەزی. پادگانی سنوری ئێرانیەکان لێرەدا بو. ئەوان، ئەمیان کوشت. دوای ئەوە عومەر عوتبە کوڕی غەزەوانی رەوانە کرد. کاتێك رەوانەی کرد پێی فەرمو:

ئەی عوتەبە، من تۆم لەسەرزەمینی هند دەست نیشان کرد کە لەقەراغ سنوری دوژمنانە. هیوادارم خوا تۆ بەسەر ئەو دەوروبەرەدا زاڵ بکات و بۆ زاڵبون بەسەر ئەو شوێنانە هاوکاریت بکات. بۆ عەلا کوڕی حەزرەمی نامەم نوسی تا عەرفەجە کوڕی هەسمە بۆ هاوکاری تۆ بنێرێت. ئەوپیاوێکی شەڕکەر و ئازا لەبەرابەر دوژمنانە. کاتێك هاتە لای تۆ، راوێژی لەگەڵ بکە و خەڵك بۆ باوەڕهێنان بانگێشت بکە. هەرکەس وەڵامی بانگێشتەکەی تۆی دایەوە، لێی رازی بە و هەر کەس رازی نەبو، باج بدات یا بۆ شمشێر ئامادە بێت. لەخوا بترسە کە لەگەڵ ئەو خەڵکەی فەرمانڕەواییان دەکەیت چۆن هەڵس کەوت دەکەیت و چی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا دەهێنیت کەبەسەریدا زاڵیت. ئاگادار بە ئەم جەستە خاکیە تۆ بەرەو لەخۆرازی بونی زیانبار نەبات کەبراکانت لەتۆ بڕمنجێنێت و بیانتارێنێت. تۆ شەرەفی هاورێیەتی پێغەمبەر(ص)ت پێبڕاوە و لەروناکی ئەو دوای ریسوایی رێزدار بویت و لەدوای ناتەوانی بەهێز بویت تا فەرمانڕەوایەکی زاڵ وپاشایەکی بەختەوەر بیت. دەڵێیت و لەتۆدەبیستن و فەرمان دەدەیت و فەرمانەکانت جێبەجێ دەکەن. چ بەخشینێکی گەورەیە ئەگەر تۆ لەسنور بەدەر نەکات و بەسەر ژێر دەستەکان یاخیت نەکات. لەبەخشین و کەڵك وەرگرتن بەهەمان شێوە خۆت بەدور بگرە کەلە گوناه دەترسیت. لەناو ئەم دوانە، کەڵك وەرگرتنە زیانی زیاتر بەتۆ دەگەیێنێت و تۆ هێدی هێدی بەرەو لەخۆرازی بون دەبات و بەشێوەیەك فریوت دەدات یەکراست بەرەو جەهەننەم دەڕۆیت. پەنا بۆ خوا دەبەم لەوە بۆ تۆ و خۆم. خەڵك ماوەیەك رویان لەخوا کرد تا ئەوەی ئەم جیهانە لەنیگای ئەواندا درەوشایەوە و خوازیاری بون. خوات بوێت و ئەم دنیات نەوێت. لەخوا بترسە وەگەرنە وەك ستەمکاران دەڕوخێیت. تۆ لەگەڵ هاورێکانت بەرێکەوە و کاتێك گەشتنە شوێنێك دورتر لەخاکی عەرەب و نزیکترین شوێن بەسەرزەمینی ئێران، لەوێ بمێننەوە.

عوتەبە لەگەڵ هاورێکانی خۆی بەرێکەوت تا کاتێك گەشتنە مەربد، بەرەو پێش رۆیشتن تا روبەروی بردی (خورد) دابەزین و لەوێ مانەوە. هەواڵی ئەوان بەخواوەندی فورات گەیشت و ئەو لەگەڵ چوار هەزار پیاوی شەڕکەر هات و هەردولا روبەروی یەك بونەوە. عوتەبە هاورێ لەگەڵ پێنسەد پیاوی شەڕکەر، دوای نیمەڕۆ شەری لەگەڵدا کردن و هەموویانی کوشتار کرد. جگە لەخواوەندی فورات کەس نەمایەوە و ئەویشی

بەئەسیری گرت. دواتر عوتەبە لەناو هاورێکانی خۆی وتارێکیدا و وتی: ئەم جیهانە کۆتایی پێهاتوە و بەخێرایی بەرەو کۆتایی دەروات و جگە لەپاشماوەیەك وەك ناوی ماوە لەناو دەفر، هیچی لێ نەماوەتەوە. ئاگادارن لێرەوە بەرەو دنیایی هەمیشەیی دەڕۆن. وشیار بن بەباشترین پاشەکەوت رو لەوێ بکەن. بە منیان وتوەکە: ئەگەر تاشەبەردێك لەسەرەوەی جەهەننەم بخەنەخوار، ماوەی حەفتا ساڵی پێدەچێت تا بگاتە خوار. ئەوێ لێوانلێو دەکەن لەخەڵکان و ئەمە هۆکاری سەرسوڕمانی ئێوەیە. بەمنیان وتوە لەنێوان دو تای درگا لەدرگاکانی بەهەشت، تێپەڕین چل پاییزە و بێ گومان رۆژێ دەگات بەهەشت لێوانلێو بێت لەخەڵك. من لەبیرمە حەوتەمین کەس لەباوەڕهێنەران بەپێغەمبەر(ص) بوم. هیچ خواردنێکمان جگە لەگەڵای (سەمور) نەبو تا لێوەکانمان لەزبری ئەو گەڵایە بریندار بو. پارچەیەك لەقوماشێکی ڕا ڕام دۆزیەوە لەگەڵ خۆم و سەعد دابەشم کرد و بۆ ئەم کارە لەناوەڕاستەوە دڕیم. ئەمڕۆ هەر حەوت کەسەکە فەرمانڕەوایی وڵاتەکانن. دوای ئێمە خەڵك تاقی دەکەنەوە.

دابەزینی ئەو لەبەسرە لەمانگی رەبیع الاوەل یا رەبیع الثانی لەساڵی چواردەیەم /مەی یا ژوئەنی ٦٣٥ زایینی بو. دەستەیەك دەڵێن بەسرە لەساڵی ٦٣٧/١٦ زایینی دوای تکریت و جەلەولا دەستی بەسەرداگیرا. سەعد بەفەرمانی عومەر ئەوی بۆ ئەوێ نارد. کاتێك عوتەبە لەبەسرە نیشتەجێ بو، نزیکەی یەك مانگ لەوێ مایەوە کەخەڵکی ئۆبۆلە روبەروی بونەوە. لەم شارەدا پێنسەد ئەسواری لێبو کەپاسەوانیان دەکرد. ئەم شارە بەندەر و لەنگەرگەی ئەو کەشتیانە بو کەلەچینەوە دەهاتن. عوتەبە روبەرویان بویەوە و ئەوانی تێکشکاند بەشێوەیەك کە بەرەو ناو شار هەڵاتن. عوتەبە بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. خواوەند ترسی خستە دڵی ئێرانیەکان و ئەوان سامانە سوکەکانی خۆیان هەڵگرت و لەناو تێپەڕین و شارەکەیان چۆڵ کرد. موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شارەکە و کاڵا و کەل و پەلی شەڕ و ئەسیریان گرت. ئەو پێنج یەکی ئەوانەی هێنایەدەر. موسوڵمانەکان سێسەد پیاوی شەڕکەر بون. گرتنی ئەو شارە لەمانگی رەجەب یا شەعبان / ئوت یا سێپتامبەر ساڵی ٦٣٥ زایینی رویدا. دواتر لەشوێنێك بەناوی (شاری رۆژی) دابەزی و بناغەی مزگەوتێکی دارشت و بەقامیش دروستی کرد.

یەکەم زادەی ئەم شارە عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر بو. کاتێك لەدایك بو، باوکی

قوربانیەکی سەربڕی کەبەشی هەمویانی کرد چونکە ژمارەیان کەم بو. خەڵکی دەشتی میشان بۆ شەڕی ئەوان کۆبونەوە. عوتەبە روبەرویان بویەوە و ئەوانی تێکشکاند و سنورداری ئەوێی بەئەسیری گرت. قەتادە کەمەربەندێکی زێرینی دۆزیەوە و بەئونس کوڕی حەجنە بۆ عومەری نارد. عومەر پێی وت: خەڵك چۆنن؟ وتی: ئەم دنیا باوەشی بۆ کردونەتەوە و بەردەوام خواست و مەبەستی تازە دەخاتە بەردەمیان. خەڵك خوازیاری بەسرە بون و روی تێدەکەن.

عوتەبە موجاشعی کوڕی مەسعودی کردە فەرماندەی دەستەیەك و بەرەو فورات رەوانەی کردن. ئەو موغەیرە کوڕی شوعبەی کردە جێگری خۆی بۆ نوێژ خوێندن تا موجاشع بگات، کاتێك ئەو گەیشت فەرمانەدیی بگرێتە دەست. عوتەبە رۆیشتە لای عومەر. موجاشیع بەسەر خەڵکی فوراتدا سەرکەوت. فەلیکان، یەکێك لەگەورەکانی ئێران سوپایەکی بۆ شەڕی موسوڵمانان کۆکردەوە. موغەیرە کوڕی شوعبە روبەروی بویەوە و لەمەرغاب چاویان بەیەك کەوت. شەڕی هەڵگیرسا. ژنانی موسوڵمان وتیان: باشترە پەیوەستی ئەوان بین و هاورێیەتیان بکەین. لەلەچکەکانی خۆیان ئالأیان دروست کرد وبەرەو موسوڵمانان رۆشتن. کاتێك بتپەرستەکان ئالأکانیان بینی، گومانیان کرد هێزی یارمەتیدەر بۆ موسوڵمانانە. لەبەر ئەمە هەڵاتن و موسوڵمانان بەسەریاندا زاڵبون. ئەو هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عومەر نوسی. عومەر بەعوتەبەی وت: کێت کردۆتە فەرمانڕەوای بەسرە؟ وتی: موجاشیع کوڕی مەسعود. وتی: ئایا پیاوێکی دێهاتی دەکەیتە فەرماندەی شاریەکان؟ پێی راگەیاند کەموغەیرە چی کردوە. فەرمانی پێدا بۆ سەر کارەکەی بگەڕێتەوە بەڵام عوتەبە لەرێگادا مرد. سەبارەت بەمردنەکەی ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. لەگێرانەوەی روداوەکانی ساڵی ٦٣٨/١٧ زایینی ئاماژەی پێدەدەین.

لەئەسیرەکانی میشان یەکیان یەسار ئەبولحەسەنی بەسری بو و یەکیتریان ئەرتەبان باوەگەورێی عەبدالله کوڕی عەدەن کوڕی ئەرتەبان.

دەستەیەك دەڵێن: فەرمانڕەوایی عوتەبە بەسەر بەسرە ساڵی ٦٣٦/١٥ زایینی و بەوتەی هەندێ کەس لەساڵی ٦٣٧/١٦ زایینی بو. گێڕانەوەی یەکەم راسترە.

عومەر موغەیرە کوڕی شوعبەی کردە فەرمانڕەوایی بەسەر کەدوساڵ فەرمانڕەوایەتی

کرد و دواتر بەتۆمەتی (گایینی دایکی جەمیل) گرفتار بو و ئەبوموسا بوبە فەرماندای بەسرە. دەستەیەك دەڵێن: دوای عوتەبە فەرمانداری بەئەبوموسا بەخشی و دوای ئەو بەموغەیرە.

## رووداوەکانی تری ئەم ساڵە

لەم ساڵەدا یانی ساڵی ١٤/٦٣٥ زایینی عومەر بە قامچی لەکوڕەکەی و هاوڕێکانی و ئەبومحجەنی دا بەتۆمەتی مەی خواردنەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان/ئۆکتۆبەری ٦٣٥ زایینی، عومەر فەرمانی بەخەڵکدا بۆ رێزگرتن لەم مانگە لەمزگەوتەکان کۆببنەوە و سەرقاڵی پاڕانەوە و دۆعا بن. ئەم کارەی لەمەدینە ئەنجامدا و بۆخەڵکی شارەکانی دیکەی نوسی ئەم کارە بکەن. ئەو خەڵکی بۆ ئەبی کوڕی کەعب کۆکردەوە.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد و فەرمانداری مەککە لەم کاتەدا عەتاب کوڕی ئەسید بو. فەرماندارانی تر ئەمانە بون: لەیەمەن یەعلی کوڕی مونیە، لەکوفە سەعد، لەشام ئەبوعوبەیدە کوڕی جەراح، لەبەحرەین عوسمان کوڕی ئەبی عاص یا عەلا کوڕی حەزرەمی و لەعەممان حوزەیفە کوڕی میحسەن.

لەم ساڵەدا ئەبو قوحافە باوکی ئەبوبەکر دوای کوڕەکەی خۆی مرد.

هەروەها لەم ساڵەد سەعد کوڕی عبادەی ئەنساری مرد کەدەستەیەك وتویانە مردنەکەی لەساڵی ١١/٦٣٢ زایینی یا ساڵی ١٥/٦٣٦ زایینی رویدا.

لەم ساڵەدا سەلیت کوڕی عەمرۆ کوڕی عامر کوڕی لۆئەی مرد.

لەم ساڵەدا هندی جەرگ خۆر کچی عوتەبە کوڕی رەبیع(دایکی معاویە) مرد. ئەو لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنا.

## روداوەكانی ساڵی پانزەیەمی كۆچی ٦٣٦زایینی

### دروست كردنی كوفە

دەستەیەك دەڵێن: كوفە لەم ساڵەدا لەسەر دەستی سەعد كوڕی ئەبی وەقاص بوبەشار. بوقەیلە شوێنەكەی نیشان ئەواندا. بەسەعدی وت: تۆم بۆ سەرزەمینێكی خوا رێنوێنی كرد كەمێشولەی نیە و لەنزماییەكان نزمترە. ئەوێی نیشاندا. دەستەیەك ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیكەداوە كەئاماژەی پێدەدەین.

### شەڕی مەرج روم

لەم ساڵەدا، شەڕی مەرج روم رویدا. بەشێك لەگێڕانەوەی ئەو شەڕە بەمشێوەیە كەئەبوعوبەیدەی جەراح و خالید كوڕی وەلید لەگەڵ هاورێكانی خۆیان لەفیخل هاتنەدەر و ناهەنگی حمصیان كرد. ئەوان لەزی ئەلكەلاع دابەزین. ئەم هەواڵە بەهراكلیوس گەیشت و ئەو توزەری بەتریقی رەوانە كرد كەهات و لەمەرج روم ئوردوی لێدا. مەرج روم لەرۆژئاوای دەمشقە. ئەبوعوبەیدە لەمەرج روم سوپاكەی نیشتەجێ كرد. ئەو رۆژەی ئەبوعوبەیدە دابەزی، (شەنەشی) رومی روبەروی بویەوە. هاورێ لەگەڵ سوپایەك بەئەندازەی سوپاكەی توزەر بو كەبۆ هاوكاری كردنی توزەر و پاسەوانی كردن لەخەلكی دەمشق هاتبو. كاتێك دابەزی، سەرزەمینی توزەر وشك و خاڵی لەگیا و روەك و ئاو و ئاوەدانی بو. خالید روبەروی توزەر و ئەبوعوبەیدە روبەروی شەنەش. توزەر بۆلێكۆڵینەوە لەسەر دەمشق رۆشتەدەر و خالید هاورێ لەگەل دەستەیەك لەشەڕكەران شوێنی كەوت. یەزید كوڕی ئەبی سوفیانیان وت كەتوزەر چی كردوە. ئەو رۆشتە پێشوازی توزەر. خالید كاتێك پەیوەستی ئەوان بو كەشەڕیان دەكرد. لەبەر ئەمە لەپشتەوە شمشێری خستە ناو ئەوان جگە لەچەندین كەس كەهەڵاتن كەس لەوان رزگاری نەبو. موسوڵمانان سامانەكانی ئەوانیان بەتاڵانی هەلگرت و یەزید تاڵانیەكانی لەناو شەڕكەرانی خۆی و شەڕكەرانی خالید دابەش كرد. یەزید بۆ دەمشق گەڕایەوە و خالید بۆ لای ئەبوعوبەیدەی جەراح. توزەر كوژرابو. ئەبوعوبەیدە دوای

ڕۆشتنی خالید، لەگەڵ شەنەش دەستیان بەشەڕ کرد و ئەم دوانە لەمەرج روم روبەروی یەك بونەوە و رومیەکان بەسەختی کوشتار کران وشەنەش کوژرا. موسوڵمانان تا حمص شوێنیان کەوتن. کاتێك هراکلیوس لەم هەواڵە ئاگادار بویەوە، فەرمانی بەبەتریقی حمص دا رەوانەی ئەو ناوچە بێت. ئەو خۆی ڕۆشتە رەها و ئەبوعوبەیدە ڕۆشتە حمص.

## گرتنی حمص و بەعلبەك و ناوچەكانی تر

کاتێك ئەبوعوبەیدە لەدەمەشق تەواو بو، بەرەو حمص کەوتە رێ. رێگای بەعلبەکی گرتەبەر و ئەو ناوچەی گەمارۆدا. خەڵك خوازیاری ئەمان بون. ئەبوعوبەیدە ئەمانی دان و پەیمانی ئاشتی بەست و لەوان خۆش بو و هاورێ لەگەڵ خالید ڕۆشتە حمص. دەستەیەك دەڵێن: موسوڵمانەکان لەمەرج رومەوە رەوانەی حمص بون کەئاماژەمان پێدا. کاتێك لەوێ دابەزین، شەری خەڵکانی ئەوێیان کرد و لەو رۆژە ساردانە لەبەیانی تا ئێوارێ بەردەوام دەجەنگان. هەم موسوڵمانان و هەم رۆمیەکان لەسەرمایەکی سەخت رەنجیان دەبرد. هەردولا سەرسەختانە خۆراگریان کرد. هراکلیوس پەیك و پەیامی بۆ خەڵکی خمص ناردبو کەهاوکاریان دەکات. فەرمانی بەهەمو خەڵکی جەزیرەدا بۆ شەڕ خۆیان ئامادە بکەن  و بەرەو حمص بڕۆن. ئەوان بەرەو شام ڕۆشتن تاحمص لەدەستی موسوڵمانەکان بپارێزن. سەعد کوڕی ئەبی وەقاص هێزە شەڕکەرەکانی لەعێراقەوە بۆ هیت نارد و ئەو ناوچەیان گەمارۆدا. دەستەیەك لەوان ڕۆشتنە قرقیسیا. خەڵکی جەزیرە بلاوەیان لێکرد و لەهاوکاری کردنی خەڵکی حمص پەشیمان بونەوە. خەڵکانی ئەوێ دەیانوت: شارەکەی خۆتان بپارێزن چونکە ئەوان عەرەبی پێ پەتین. کاتێك سەرما هێرشی دەکردە سەریان، قاچیان دەیبەست. قاچی رۆمیەکان دەکەوتە خوار و لەقاچی موسوڵمانان یەك پەنجەیش نەدەکەوت. کاتێك زستان تەواو بو، پیرێك لەرۆم هەستا و داوای ئاشتی لەگەڵ موسوڵمانان کرد بەلام گوێیان لێ نەگرت و ناچار یەکیتر ئامۆژگاری ئەوانی کرد بەلام ئەویش وەلامی نەبیست. موسوڵمانان ئەوانیان بانگ کرد و بەدەنگی بەرز تەکبیریان وت کەبەهۆیەوە چەندین ماڵ لەحمص دارما و دیوارەکانی لەری و قەڵشتی برد. دوبارە تەکبیریان وت و ئەمجارە گرفتاریەکی گەورەتر بەسەر

دوژمندا داباری. خەڵکەکەی هاتنەدەر و خوازیاری ئاشتی بون و موسوڵمانان نەیاندەزانی ئەوان چیان بەسەر هاتوە. لەگەڵ ئەوان لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی دەمشق پەیمانی ئاشتیان بەست. ئەبوعوبەیدە ئەم کەسانەی لەوێ جێگیر کرد: سەمتی کوڕی ئەسوەدی کندی هاورێ لەگەڵ بەنی معاویە، ئەشعەس کوڕی میناس هاورێ لەگەڵ سەکون، میقداد هاورێ لەگەڵ بەلی و کەسێتر هاورێ لەگەڵ کەسانیتر. ئەو پێنج یەکی بەعەبدالله کوڕی مەسعود بۆ عومەر رەوانە کرد. عومەر بۆ ئەبوعوبەیدەی نوسی: لەشارەکەی خۆت بمێنەرەوە وداوای هاوکاری لەبەهێزەکان بکە عەرەبەکانی شام لەدەوری خۆت کۆبکەوە و منیش بەردەوام هێزی پشتیوان بۆتۆ دەنێرم.

دواتر ئەبوعوبەیدە عوبادە کوڕی سامتی کردە جێگری خۆی و رەوانەی حەمات بو. خەڵکانی ئەوێ سەری کورنوشیان دانەواند و فەرمانبرداری بون. ئەبوعوبەیدە لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. لەوێوە رەوانەی شەیزەر بو. خەڵکەکەی هاتنەدەر و خوازیاری ئاشتی بون لەسەر بنەمای ئاشتی حەمات. ئەبوعوبەیدە روی کردە (مەعرەتی حمص) کەهەمان مەعرەتی نەعمانە و ناوەکەی لەناوی نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری وەرگیراوە. ئەوان داوای ئاشتیان کرد لەسەر بنەمای ئاشتی حمص. دواتر ڕۆشتە لازقیە کەخەڵکەکەی روبەروی بونەوە. لازقیە درگایەکی گەورە و ئەستوری بو کەبەهێزی دەستەیەك لەخەڵکان دەتوانر بکرێتەوە. موسوڵمانان لەشوێنێکی دور لەوێ ئوردویان لێدا. دواتر فەرمانیدا سەنگەری زۆر گەورە و قووڵ هەڵکەنن کەهەرکامی سوارکارێکی لەکاتی سواریدا دادەپۆشی. دواتر وایان نیشاندا کەئاهەنگی گەڕانەوەیان هەیە. کاتێك شەو خێوەتی رەشی خۆی خستە سەرزەوی، گەڕانەوە ولەسەنگەرەکاندا خۆیان حەشاردا. خەڵکی لازقیە رۆژیان کردەوە لەسەر ئەو گومانەی کەموسوڵمانان کۆچیان کردوە. لەبەر ئەمە مەڕومالاَتی خۆیان هێنایەدەر و لەدەوروبەری شار بلاَوبونەوە. هێشتا نەکەوتبونە خۆیان کەموسوڵمانان هاواریان کرد و لەگەڵ ئەوان ڕۆشتنە ناوشار. شار بەزۆر دەستی بەسەردا گیرا و دەستەیەك لەمەسیحیەکان رایان کرد و دواتر داوای ئەمانیان کرد تا بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان بگەڕێنەوە. لەسەر ئەم بنەمایە ئاشتیان لەگەڵ کرا کەباجی خۆیان بدەن چ بەروبومەکەیان کەم بێت چ فراوان. کەنیسەکەیان بەخۆیان سپێردرا. موسوڵمانان لەوێ

مزگەوتێکی گەورەیان دروست کرد. عوبادە کوڕی سامت بناغەی مزگەوتەکەی دانا و دواتر فراوانیان کرد.

کاتێك موسوڵمانان لازقیەیان گرت، خەڵکی جەبەلەی روم لەوێ کۆچیان کرد. کاتێك رۆژگاری معاویە هات، قەلایەکی روبەروی قەلای رۆمیەکان دروست کرد و دەستەیەك لەپیاوە شەڕکەرەکانی لەوێ نیشتەجێ کرد.

موسوڵمانان بەهاوکاری ئەبوعوبەیدە کوڕی سامت، دەستیان بەسەر ئەنترتوسدا گرت کەقەلایەکی بەهێزی بو. خەڵکەکەی کۆچیان کرد. دواتر معاویە بناغەی شاری ئەنترتوسی داڕشت و کردی بەشارێك و ئاوەدانیەکانی دەوروبەری بەموسوڵمانان بەخشی. لەشاری بانیاسیش ئەم کارەی کرد: سەلیەیش دەستی بەسەردا گیرا. دەڵێن بۆیە پێی وتراوە سەلیە چونکە لەنزیکی ئەوێ شارێك بوبەناوی موتەفیکە کەبەسەر خەڵکەکەی وێران بو و جگە لەسەد کەس رزگاری نەبو. ئەوان سەد ماڵیان بۆخۆیان دروست کرد و شوێنی تازەیان بە (سلم مائە) (سەد رزگاربو) ناو برد. دواتر خەڵك ناوەکەیان گۆڕی و بەسەلیە ناویان برد. ئەمە کاتێك راستە کەخەڵکەکەی عەرەب بێت و زمانەکەیان عەرەبی بێت. بەلام ئەگەر زمانەکەیان عەرەبی نەبێت، ئەم داستانە راست نیە. دواتر سالح کوڕی عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس ئەوێی وەك شوێنی نیشتەجێبونی خۆی هەڵبژارد و منالەکانی لەوێ چەندین بینایان دروست کرد و کردیان بەشار و کەسانێك لەبنەماڵەی ئەو لەو شارە ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەم شارە و زەمینەکانی دەوروبەری بەوان بڕا.

## دست بەسەرداگرتنی قێنسرین و هاتنی هراکلیوس بۆ کۆنستانتین ئوپل (قوستەنتەنیە)

دواتر ئەبوعوبەیدەی جەراح، خالید کوڕی وەلیدی بەرەو قێنسرین رەوانە کرد. کاتێك گەشتە ئەو شارە، رۆمیەکان پێشڕەویان کرد و فەرماندەکەیان میناس بو. ئەو گەورەترین پیاوی رۆم دوای هێرکول بو. شەڕ دەستی پێکرد و میناس وهاورێکانی بەشێوەیەکی قورس و کەم وێنە کوشتار کران. هەمویان لەسەر یەك خوێن مردن. خالید رۆیشت تا لەقێنسرین دابەزی و خەڵکەکەی لەقەلاکاندا خۆیان شاردەوە. وتی:

ئەگەر لەناو هەورەکاندا بن، یا خوا ئێمە دەهێنێت بۆ لای ئێوە یا ئێوە دەهێنێت بۆ لای ئێمە. ئەوان لەکاروبارەکانی خۆیان تێفکرین و ببینیان چی بەسەر خەڵکی حمص هاتوە. لەبەر ئەمە لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی حمصیەکان پێشنیاری ئاشتیاندا. خالید پێداگری گرت کەجگە لەوێران کردنی شارەکە کارێکی دیکە ناکات. شارەکەی وێران کرد. لەم کاتەدا بوهراکلیوس رۆشتەناو کۆنستانتین نوپل. هۆکارەکەی ئەوەبو: خالید و عەیاز لەدەروازەی شامەوە بەرەو هراکلیوس ڕۆشتن و عەمرۆ کوڕی مالك لەکوفە. ئەو پانتاییەکانی قرقیسیا هاتەدەر. عەبدالله کوڕی موتعم لەدەروازەی موسڵ هاتەدەر. لەم کاتەدا بو هراکلیوس روی کردە کۆنستانتین ئوپل. ئەمە یەکەم شار لەئیسلامدا بو کە لەساڵی ١٥/٦٣٦زایینی یا ١٦/٦٣٧ زایینی لەسێ قۆڵەوە پێشڕەویان بۆ کرد.

کاتێك هەواڵی کاری خالید بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت، وتی: خالید خۆی کردە فەرمانڕەوا، خوا لەئەبوبەکر خۆش بێت کەسرشتی پیاوانی باشتر لەمن دەزانی! عومەر ئەو و موسەنا کوڕی حارسەی لەسەر کار لابردبو. عومەر وتی: لەبەر ئەوە ئەوانم لەسەر کار لانەبرد کەکاری ناڕەوایان کردبێت بەڵکو چونکە خەڵك ئەوانیان بەگەورە دەزانی، ترسام روبکەنە ئەوان و پشت بەوان ببەستن.

## درێژەی کارەکانی هراکلیوس

**بەڵام موسەنا، عومەر لەبۆچونەکەی خۆی سەبارەت بەو پەشیمان بویەوە وئەمە لەبەر ئەو کارانەبو کەدوای ئەبوعوبەیدەی ئەنجامیدا.. بەڵێ، هراکلیوس لەرەها هاتەدەر. یەکەم کەس لەموسوڵمانان کەسەگەکانی ناچار بەزوزاندن و چوارپێکانی ئەوانی ناچار بەڕەم کردن کرد، زیاد کوڕی حەنزەله لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بو.**

**هراکلیوس ڕۆشت و لەشیمشات دابەزی و لەدەروازەی ئەوێ رویکردە کۆنستانتین نوپل. کاتێك ویستی لەوێ بڕوات، ڕۆشتە شوێنێکی بەرز و روی کردە شام و وتی: سڵاو لەتۆ ئەی سوریە!، سڵاوێك کەدوای ئەوە دیدارێك نیە. ئیتر هیچکات رۆمیەك مەگەر تۆقاو بۆ لای تۆ ناگەڕێتەوە تا ئەو مناڵە شومە لەدایك بزێت خۆزگە نەزێت! چەند شیرینە کارەکەی ئەو و چەندە تاڵە ئاژاوەکەی بۆ رۆمیەکان! دواتر بەرێکەوت تا گەشتە**

كۆنستانیتن ئوپل. پیاوانی قەلآكانی ئەسكەندەریەی تا تەرسوسی لەگەڵ خۆی هەڵگرت تا موسوڵمانان لەنێوان ئەنتاكیە تا سەرزەمینەكانی رۆم ئاوەدانیان دەست نەكەوێت بتوانن لەوێوە تێپەڕن. ئەو قەلآكانی چۆڵ كرد و موسوڵمانان كەسیان لەوێ نەدەدۆزیەوە. هەندێ كات رۆمیەكان لەوێ خۆیان حەشار دەدا و لەنائاگایی دواكەوتوان لەلەشكر كەڵێكیان وەردەگرت و هێرشیان دەكردە سەر ئەوان. لەبەر ئەمە موسوڵمانان لەم ناوچانە بەوشیاریەوە هەڵس وكەوتیان دەكرد.

## گرتنی ئەنتاكیە و پایتەختەكانی دیكە

كاتێك ئەبوعوبەیدە لەقێنسرین تەواو بو، بەرەو حەلەب ڕۆیشت و بیستی خەڵكی قێنسرین پەیمانەكەی خۆیان شكاندوە و خیانەتیان كردوە. لەبەر ئەمە سەمتی كەندی رەوانەی ئەوێ كرد كەئەوانی گەمارۆدا و ئەو شارەی گرت و مەڕ و مانگای فراوانی دەستكەوت. ئەوانی لەناو سوپاكەی خۆیدا دابەش كرد و پاشماوەكەی وەك تالآنی هەڵگرت. ئەبوعوبەیدە گەیشتە دەوروبەرەكانی (حازر حەلەب) و چەندین دەستە لەعەرەبەكانی لەدەوری خۆی كۆكردەوە. ئەبوعوبەیدە لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و دواتر ئەوان باوەڕیان بەئیسلام هێنا. دواتر ڕۆشتە حەلەب وفەرماندەی پێشەنگەكانی عەیاز كوڕی غەنەمی فێهری بو. خەڵك لەقەلآكاندا خۆیان شاردەوە و موسوڵمانان ئەوانیان گەمارۆدا بەلآم ئەوەندەی نەخایاند كەخوازیاری ئاشتی بۆ خۆی و منداڵەكانی و شار و قەلآ و كەنیسەكانی خۆیان بون كەبەدەستیان هێنا. شوێنی مزگەوت لەدەرەوەی پەیمانی ئاشتیەكەبو. ئەوەی لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی بەست، عەیاز كوڕی غەنەم بو و ئەبوعوبەیدە كارەكەی بەڕەوا لەقەڵەمدا.

دەستەیەك دەڵێن: لەسەر ئەو بنەمایە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەسترا كەماڵ و كەنیسەكانی خۆیان نیوبەنیو بەموسوڵمانان بسپێرن. دەستەیەكی دیكە دەڵێن: ئەبوعوبەیدە كەسی لەحەلەب دەست نەكەوت چونكە خەڵكەكەی بۆ ئەنتاكیە كۆچیان كردبو. لەم ناوەدا پەیك و پەیام بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی هاتوچۆی دەكرد و كاتێك بەسترا، خەڵك بۆ ئەوێ گەڕانەوە.

ئەبوعوبەیدە لەحەلەب بەرەو ئەنتاكیە ڕۆشت. لێرە چەندین دەستە لەخەڵكانی

ڤێنسریە و کەسانیتر لەقەڵاکاندا خۆیان حەشاردابو. کاتێك لەوێ تێپەڕی، سوپای دوژمن روبەروی بویەوە کەئەوانی تێکشکاند و بۆ ناو شارەکە پاشەکشێی پێکردن و لەهەمو لایەکەوە گەمارۆیدان. دواتر ئەوان لەسەر بنەمای کۆچ کردن لەشار یا دانی باج پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. دەستەیەك کۆچیان کرد و دەستەیەك مانەوە کەئەمانیان پێدان. دواتر پەیمانەکەی خۆیان شکاند و ئەبوعوبەیدە عەیاز کوڕی غەنەم و حەبیب کوڕی مەسلەمەی رەوانەی ناوچەکانی ئەوان کرد کە لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی یەکەم، دەستیان بەسەردا گرت.

ئەنتاکیە لای موسوڵمانەکان ناوبانگێکی گەورەی هەبو. کاتێك دەستی بەسەرداگیرا، عومەر نامەی بۆ ئەبوعوبەیدە نوسی کەدەستەیەك لەموسوڵمانان لەئەنتاکیە جێگیر بکە و ئەوان بکەرە پاسەوانی ئەم شارە، بەڵام بەخشش لەوان وەرمەگرە.

دواتر ئەم هەواڵە بەئەبوعوبەیدە گەیشت کەدەستەیەك لەرۆمیەکان لەنێوان مەعرەت مەصرەین و حەلەبن. روی کردە ئەوان و روبەرویان بویەوە و شەڕی ئەوانی کرد و شکەستی دان و دەستەیەك لەبەتریقەکان کوشت و ئەسیر و تاڵانی زۆری گرت و مەعرەت مەصرەینی لەسەر بنەمای ئاشتی حەلەب گرت. سوارە شەڕکەرەکانی ئەو بەرەو پێش رۆیشتن تا گەیشتنە بوقا و دێهاتەکانی جومە وسەرمین و تیزینیان گرت و بەسەر هەمو سەرزەمینی ڤێنسرین و ئەنتاکیە زاڵبون. دواتر ئەبوعوبەیدە گەڕایەوە حەلەب و بینی خەڵکەکەی شۆڕشیان دەست پێکردوە. ئەوندە شەڕی ئەوانی کرد تا سەریان دانەواند و موسوڵمانان شارەکەیان گرت. ئەبوعوبەیدە بەرێکەوت و فەرماندەی پێشەنگەکانی عەیاز بو. یەکێك لەخواپەرستە مەسیحیەکان رۆشتە لای و خوازیاری ئاشتی بو. ئەویان بۆ لای ئەبوعوبەیدە رەوانە کرد کە لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی ئەنتاکیە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. ئەبوعوبەیدە سوپاکەی خۆی لەو ناوچەنادا بڵاو کردەوە و موسوڵمانەکان بەسەر هەمو سەرزەمینەکانی قورسدا زاڵبون و دەستیان بەسەر تەل عەزازدا گرت. سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی لەناو سوپاکەی ئەبوعوبەیدەدا بو. ئەو لەقەڵای قورس مایەوە و لەو رۆژەوە بەقەڵای سەلمان ناوی دەبەن.

دواتر ئەبوعوبەیدە بەرەو مەنبج بەرێکەوت و فەرماندەی پێشەنگەکانی عەیاز بو. ئەبوعوبەیدە پەیوەستی بو و بینی لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی ئەنتاکیە پەیمانی

ئاشتی لەگەڵدا بەستون. عەیازی بۆ پانتاییەکانی دۆلووك و رەعبان رەوانە کرد و لەگەڵ خەڵکەکەی هاوشێوەی مەنبج پەیمانی ئاشتی بەست. هەروەها پەیمانی لەگەڵ بەستن کەهەوالی رۆمیەکان بەموسوڵمانان بگەیێنن. ئەبوعوبەیدە بۆ هەر شارێك کەدەستی بەسەردا دەگرت، فەرمانداریکی دیاری دەکرد و چەندین دەستەی شەڕکەری دەکردە هاورێی و ئەو شوێنانەی مەترسیان لێدەکرا، لێوانلێوی دەکرد لەپیاوە شەڕکەرەکان. دواتر بەرەو بالس بەرێکەوت و سوپایەکی بەفەرماندەی حەبیب کوڕی موسلیمە بەرەو قاصرین رەوانە کرد کەلەگەڵ خەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی باج یا کۆچ کردن پەیمانی ئاشتی بەست. زۆربەی ئەوان بۆ شارەکانی رۆم و سەرزەمینی جەزیرە و دێهاتەکانی پردی مەنبج کۆچیان کرد. ئەو رۆژگارە پردێك لەئارادا نەبو بەڵکو لەسەردەمی عوسمانیەکان بۆ هێنانی خواردەمەنی زستانە بۆ خەڵك و چوارپێکان دروستیان کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نیە بەڵکو پردەکە چەندین ریزی نیوە وێرانی سەردەمی کۆنی پێوە دیار بو. موسوڵمانان لەشام لەپانتاییەوە تا فورات بەسەر هەمو شوێنەکاندا زاڵبون. ئەبوعوبەیدە بۆ فەلەستین گەڕایەوە.

لەکوێستانەکای لۆکام شارێك بو پێیان دەوت جەرجرومە و خەڵکەکەیان بەجەرحەمیەکان ناودەبرد. حەبیب کوڕی موسلیمە لەئەنتاکیەوە بەرەو ئەو شارە کەوتە رێ و بەئاشتی دەستی بەسەردا گرت لەسەر بنەمای ئەوەی یار و هاوکاری موسوڵمانەکان بن.

لەم ساڵەدا ئەبوعوبەیدە کوڕی جەراح سوپایەکی هاورێ لەگەڵ مەیسەرە کوڕی مەسروقی عەبەسی رەوانە کرد کە لەگەروی کوێستانی بەغراس (لەناوەدانیەکانی دەوروبەری ئەنتاکیە) تێپەڕیان کرد و بەرەو سەرزەمینەکانی رۆم رەوانە بون. ئەو یەکەم کەس بو لەم گەروە تێپەڕی کرد. لەوێ روبەروی چەندین دەستە لەرۆمیەکان و عەرەبەکان لە غەسان و تەنوخ و ئەیاد بویەوە کەدەیانویست پەیوەستی هراکلیوس بن. شەڕی ئەوانی کرد و کوشتارێکی گەورەی لەناو ئەواندا دەست پێکرد. دواتر مالکی ئەشتەری نەخەعی بەسەرکردایەتی هێزە پشتیوانەکان لەلایەن ئەبوعوبەیدەوە پەیوەستی بو و ئەو لەم کاتەدا لەئەنتاکیە بەسەری دەبرد. ئەوان تەندروست گەڕانەوە. سوپایەکیتری لەگەڵ خالید کوڕی وەلید بۆ مەرعەش نارد. خالید دەستی بەسەر ئەم

شارەدا گرت لەسەر بنەمای کۆچ کردنی خەڵکەکەی و دواتر وێرانی کرد. سوپایەکی دیکەی لەگەڵ حەبیبی موسلیمە بۆ قەڵای حەدەس رەوانە کرد. لەبەر ئەوە پێیان دەوت پردی حەدەس (پردی مێردمنداڵ) چونکە مێردمنداڵێکیان بینی هاوڕێ لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی شەڕی ئەمانی کرد و لەو رۆژەوە بەپردی مێردمنداڵ ناوی دەبەن. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوە بو چونکە موسوڵمانان لەوێ زیانی زۆریان بەرکەوت و لەبەر ئەمە پێیان وت پردی روداو یا کارەسات. بەنی ئومەییە بەپردی تەندروستی ناویان دەبرد.

## دەست بەسەردا گرتنی قیساریە و گەمارۆدانی غەزە

لەم ساڵەدا یا ساڵی ١٩/٦٤٠ یا ٢٠ /٦٤١ زایینی قیساریە دەستی بەسەرداگیرا. هۆکاری ئەم شەڕە بەمشێوە بو کەعومەر نامەیەکی بۆ یەزید کوڕی ئەبی سوفیان نوسی و تیایدا معاویەی بۆ قیساریە رەوانە کرد. عومەر نامەیەکی بۆ معاویە نوسی وفەرمانی رەوانە بونی پێدا. معاویە ڕۆشت و خەڵکەکەی گەمارۆدا. ئەوان بەردەوام هێرشیان دەهێنا وشەڕیان دەکرد. معاویە ئەوانی تێکشکاند وبۆ ناو قەڵاکە پاشەکشێی پێکردن. لەئەنجامدا، باوەشیان بۆ مەرگ کردەوە و هەڵمەتیان برد. کوژراوەکانی ئەوان لەم شەڕەدا بەهەشتا هەزار کەس مەزندە دەکرا لەکاتی شکانی ئەوان ژمارەی کوژراوەکان تا سەد هەزار کەس گەیشت. عەلقەمە کوڕی موجزەر، گەمارۆ قیقاری لەغەزەدا بو و بەردەوام پەیك و پەیامی رەوانە دەکرد. هیچ کەس هەواڵێکی دڵخۆشکەر وئارام بەخشی بۆ نەهێنا. ئەوخۆی رۆشتە لای قیقار و وای نیشاندا نێردراوی عەلقەمەیە. قیقار فەرمانی بەپیاوێکدا لەسەر رێگاکەی دانیشت و کاتێك تێدەپەڕێت، بیکوژێت. عەلقەمە لەم فێڵە ئاگادار بویەوە و وتی: من چەند کەسێکم لەگەڵدایە کەبۆچونی ئەوانیش گرنگە. تۆ برۆ تا من ئەوانیش بێنم. قیقار کەسی بۆ لای ئەو پیاوە نارد کەزیانی پێنەگەیێنێت؟ عەلقەمە هات و نەگەڕایەوە. ئەو کارەی لەگەڵ کرد کەعەمرۆ لەگەڵ ئەرتەبون.

## دەست بەسەرداگرتنی بەیسان و شەڕی ئەجنادین

کاتێك خالید و ئەبوعوبەیدە بۆ حمص گەڕانەوە، عەمرۆ و شورەحبیل بەرەو بەیسان ڕەوانە بون و دەستیان بەسەرداگرت و لەگەڵ خەڵکی ئوردون پەیمانی ئاشتیان بەست. سوپاکانی ڕۆمی لەبەیسان و ئەجنادین وغەزە کۆبونەوە. عەمرۆ و شورەحبیل لەکاتێکدا ئەرتەبون و هاورێکانی لەئەجنادین بون، بەرەو لای ئەو ڕەوانە بون. ئەو، ئەبو ئەعوەری کردە جێگری خۆی لەئوردون و لای ئەرتەبون دابەزی کەرۆمیەکان هاورێیەتیان دەکرد. ئەرتەبون وشیارترین و دورئەندێشترین سەرداری ڕۆمی بو. ئەو لەشارەکانی ڕەملە سوپایەکی گەورەی جێگیر کردبو و لەئیلیا سوپایەکی گەورەی بۆ پاسەوانی کردن دانابو. کاتێك ئەم هەواڵە بەعومەر گەیشت، وتی: ئەرتەبونی ڕۆم، ئەرتەبونی عەرەبی بۆ شەڕی ئێمە ڕەوانە کردوە. بڕوانن بزانن شەڕ لەبەرژەوەندی کام لایەن کۆتایی پێدێت و لەم ناوەدا پەردە لەسەر چ ڕوداوێك هەڵدەماڵدرێت.

معاویە خەڵکی قیساریەی سەرقاڵ و گرفتار کردبو تا نەتوانن بۆ شەڕی عەمرۆ ڕەوانە ببن. عەمرۆ عەلقەمە کوڕی حەکیمی فوراسی و مەسروق کوڕی فلان عەکی بۆ شەڕکردن لەگەڵ خەڵکی ئیلیا ڕاسپاردبو. ئەوان زیانی ئەو خەڵکەیان لەعەمرۆ دورخستەوە. هەروەها ئەبو ئەیوبی مالکی ناردبوە سەر خەڵکی ڕەملە لەرۆمیەکان تا ئەوان سەرقاڵ بکات. هێزە پشتیوانەکان لەلایەن عومەرەوە بەردەوام دەگەیشتنە لای عەمرۆ. عەمرۆ لەئەجنادین مایەوە و نەیدەتوانی ڕوبەڕوی ئەرتەبون ببێتەوە. نێردراوانیش هەواڵی دڵخۆشکەریان نەدەهێنا. ئەو خۆی ڕۆشتە لای ئەرتەبون و وای نیشاندا نێردراوی عەمرۆیە. ئەرتەبون ئەوی ناسیەوە و وتی: گومانی تیا نیە ئەمە فەرماندەیە یا کەسێکە فەرماندە گوێ لەقسەکانی دەگرێت و بەکاریان دەبات. لەبەر ئەمە کەسێکی لەسەر ڕێگاکەی دانا تا کاتێك عەمرۆ تێدەپەڕێت، بیکوژێت. عەمرۆ لەم فێڵە ئاگادار بویەوە و پێی وت: وتاری منت بیست و وتاری تۆم بیست. قسەکانم کاریگەری لەسەر تۆدانا بەڵام من یەکێکم لەو بیست کەسەی عەمرۆ ئێمەی بۆ لای ئەم فەرمانڕەوایە نارد تا هاوکاری بکەین. تۆ بگەڕێرەوە تامن ئەوان بێنمە لای تۆ، ئەگەر ئەوان بەپێشنیارەکەی تۆ ڕازی بون، فەرماندەیش پێی ڕازی دەبێت و سوپاکەیش.

ئەگەر رازی نەبون، ئەوان بۆ شوێنە ئەمنەکەیان دەگەڕێنیتەوە. وتی: ئەم کارە دەکەم. فەرمانی کوشتنەکەی هەڵوەشاندەوە. عەمرۆ ڕۆیشت و پیاوی رۆمی تێگەیشت فریوێك بو کەئەویان پێ فریودا.

هەواڵی فێڵەکەی ئەو بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت. وتی: ئافەرین بۆ پیاوێکی وشیار کەعەمرۆیە! عەمرۆ تێگەیشت چۆن دەبێت بەسەریدا زاڵبێت. روبەروی بویەوە و لەئەجنادین شەڕێکی گەورە رویدا کەهاوشێوەی شەڕی یەرموك بو. کوژراوەکان لەناویاندا روی لەزۆربون کرد و ئەرتەبون بەرەو ئیلیا رایکرد. عەمرۆ لەئەجنادین دابەزی و موسوڵمانان کەبەیت ئەلموقەدەسیان گەمارۆدابو، لەبەرژەوەندی ئەرتەبون لەو ناوچانە بڵاوەیان لێکرد. ئەو ڕۆشتە ئیلیا و موسوڵمانانی لەو ناوچەیە بڵاوە پێکرد و بەرەو لای عەمرۆ پاشەکشێی پێکردن.

گێڕانەوەی شەڕی ئەجنادین( لەسەر بنەمای گێڕانەوەی کەسێك کەزیاتر لەیەرموکی دەزانێت) ئاماژەی پێدرا. شێوەی گێڕانەوەکەی جیاواز لەمەبو. لەبەر ئەوە بو لەوێ و لێرەدا ئاماژەمان پێدا.

## دەست بەسەرداگرتنی بەیت ئەلموقەدس کەهەمان ئیلیە

لەم ساڵەدا یا لەمانگی رەبیع الاولی ساڵی ٢٠/ فەوریەی ٦٤١ بەیت ئەلموقەدەس دەستی بەسەردا گیرا.

چۆنیەتی ئەوەی: کاتێك ئەرتەبون دەستی بە سەر ئیلیا ، عەمرۆ دەستی بەسەر غەزەدا گرت( دەستەیەك دەڵێن: گرتنی ئەوشارە لەسەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکردا بو). دواتر دەستی بەسەر سەبسەتیەدا گرت کەگۆڕی یەحیا کوڕی زەکەریا لەوێدایە. لەسەر بنەمای دانی باج دەستی بەسەر نابلوسدا گرت و دوای ئەوە شاری (لد). دواتر یوبنی و عەمەواس و بەیت جەبرین و یافای گرت. دەستەیەك دەڵێن: معاویە ئەو شارەی گرت. عەمرۆ مەرج عیونی گرت. کاتێك ئەم کارە لەبەرژەوەندی ئەو تەواو بو، پیاوێکی بۆ لای ئەرتەبون نارد کەزمانی رۆمی دەزانی. پێی وت: ئەوەی دەیڵێت، بەجوانی بیبیستێت. لەگەڵ ئەودا نوسراوێکی نارد. نێردراو گەیشت و نامەکەی لەکاتێکدا وەزیرەکانی ئەرتەبون لای دانیشتبون، تەسلیم کرد. ئەرتەبون وتی: سوێند بەخوا

عەمرۆ دوای ئەجنادین دەست بەسەر هیچ بەشێك لەخاكی فەلەستین ناگرێت.
پێیان وت: ئەمەت لەكوێوە زانی؟ وتی: ئەو كەسەی دەستی بەسەردا دگرێت ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە. ئەو ئامازەی بەتایبەتمەندیەكانی عومەر كوڕی خەتاب دا. نێردراو بۆ لای عەمرۆ گەڕایەوە و ئەم هەواڵەی پێراگەیاند. لەبەر ئەمە بۆ عومەر نامەی نوسی و وتی: من روبەروی دوژمنێكی سەخت و كۆڵنەدەرم و لەسەرزەمینێكدام كە بۆتۆ پاشەكەوت كراوە. عومەر زانی كەعەمرۆ ئەم قسانەی تەنیا لەسەر بنەمای ئەو وتارەی بیستویەتی، ئەنوسیوە. لەبەر ئەمە لەمەدینەوە بەرێكەوت.
دەستەیەك دەڵێن: هۆكاری هاتنی عومەر بۆ شام ئەوە بو كەئەبوعوبەیدە گەمارۆی بەیت ئەلموقەدەسیدا و خەڵك داوایان لێكرد لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی شارەكانی شام لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی ببەستێت و رێكخەری پەیمانەكە عومەر كوڕی خەتاب بێت. ئەو ئەم پێشنیارەی بۆ عومەر نارد وعومەر لەمەدینەوە بەرێكەوت و عەلی كوڕی ئەبی تالبی كردە جێگری خۆی. عەلی وتی: بەتەنیا بۆ كوێ دەڕۆیت؟ تۆ دەتەوێت روبەروی دوژمنێكی بەهێز و دڕندە ببێتەوە. عومەر وتی: پێش مردنی عەباس شەڕێك بكەم كەئەگەر عەباس بمرێت زیانەكانی ئێوە لەت لەت بێت بەهەمان شێوە كەتەنافێك لەت لەت دەبێت. عەباس لەشەشەم ساڵی خەلافەتی عوسمان كۆچی دوایی كرد.
عومەر سوار لەسەر ئەسپ بەرێكەوت و لەجابیە دابەزی. هەمو ئەو جارانەی سەردانی شامی كردبو، چوار جار بو: یەكەم جار بەئەسپ، دوەم جار بەوشتر، سێیەم جار لەسەر ئێستر كەبەهۆی دەركەوتنی تاعون گەڕایەوە و چوارەم جار سوار لەسەر كەر. نامەی بۆ فەرماندەی سوپاكان نوسی كە لەجابیە لەو رۆژەی كە بە موجەرەدە ناوی بردبو، بڕۆنە لای. یەكەم كەس گەیشتە لای، یەزید و دواتر ئەبوعوبەیدە و بەدوای ئەودا خالید.
ئەوان سوار لەسەر ئەسپە تیژپێكان و زینە هەوریشمینەكان بون. ئەو دابەزی، بەردێكی هەڵگرت و بۆ ئەوانی هاویشت و وتی: چەند خێرا بۆچون و باوەڕی خۆتان گۆڕی! بەم شێوە و جل و بەرگە دێنە لای من كەهێشتا دو ساڵ تێپەڕی نەكردوە! سوێند بەخوا ئەگەر ئەم كارەتان لەدوسەد ساڵیدا دەكرد كەسانی دیكەم لەشوێنی ئێوە دادەنا. وتیان: ئەی ئەمیری موسوڵمانان، ئەمانە یەلقەكان (زرێیەكی چەند پارچەیین) و ئێمە بەتەواوی بەكەل وپەلەكانی شەڕ داپۆشراوین. وتی: ئەگەر بەم شێوەیە، ترسم نیە.

سوار بو و رۆشتە جابیە و عەمرۆ و شورەحبیل بەشێوەیەك بون وەك بڵێی لەشوێنەکەیان تەکانیان نەخواردبو.

کاتێك عومەر لەجابیە دابەزی، یەکێك لەجولەکەکان وتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان، تۆ بۆ سەرزەمینی خۆت ناگەڕێیتەوە مەگەر ئەوەی خواوەند لەسەردەستی تۆ دەست بەسەر سەرزەمینی ئیلیا دا بگرێت. خەڵکی ئیلیا عەمرۆیان بێزار کردبو و عەمرۆیش ئەوانی بێزار. بەڵام نەتوانایی گرتنی شارەکەی هەبو نەتوانایی گرتنی رەملە. لەم کاتەدا کەعومەر لەجابیە ئوردوی لێدابو، لەناکاو خەڵك پەلاماری کەرەستەکانی شەڕی خۆیاندا. عومەر وتی: چیتان بەسەر هاتوە؟ وتیان: ئایا ئەسپەکان و شمشێرە درەوشاوەکان نابینیت؟ عومەر وتی: مەترسن و ئەمانیان پێبدەن چونکە داوای ئەمان دەکەن. ئەوان خەڵکی ئیلیا وشارەکانی دەوروبەر بون. عومەر لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و ئەوان شارەکانیان بۆ کردەوە. ئەو کەسەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست (عەوام) بو چونکە ئەو کاتەی عومەر هاتە شام، ئەرتەبون و تەزاروق رۆشتنە میسر و نامەکەی ئەویان سەبارەت بەئیلیا و رەملە و شارەکانی دەوروبەری، لەگەڵ خۆیاندا برد. ئەو جولەکەیە لەکاتی بەستنی پەیمانی ئاشتی ئامادە بو. عومەر سەبارەت بەدەجال پرسیاری لێکرد و پرسیاری زۆری لێکرد. جولەکە وتی: لە چ شتێك ئەوەندە پرسیار دەکەیت ئەی ئەمیری موسوڵمانان؟ سوێند بەخوا ئێوە لەشوێنێك سیانزە گەز دورتر لەدەروازەی شاری (لد) دەیکوژن. عومەر ئەمان نامەی بۆ ئەوان نارد. عەلقەمە کوڕی حەکیمی کردە فەرمانڕەوایی نیوەی فەلەستین و عەلقەمە کوڕی مەجزەری کردە فەرمانڕەوایی نیوەکەی تر و لەئیلیا جێگیری کرد. لەجابیە عەمرۆ و شورەحبیلی پەیوەستی خۆی کرد. ئەم دوانە کاتێك بینیان کەسوار لەسەر ئەسپ بو و شوێن پێکەیان ماچ کرد. عومەر هەردوکیانی بەرز کردەوە و لەئامێزی گرتن.

دواتر لەجابیە بەرەو بەیت ئەلموقەدەس رۆیشت. سوار ئەسپێك بو، بینی شەلە. لەو ئەسپە هاتە خوار و بۆ ئەو بێرزون (ئێسترى تاتارى، چوارپێیەك بچوکتر لەئەسپ و بەتواناتر لەکەر)یان هێنا و سواری بو. چوارپێ سەرەتا دەستی بەجوتەخستن کرد. عومەر دابەزی و قامچی لەروخساری چوارپێکەدا و وتی: نازانم کێ تۆی فێری ئەم

لەخۆبایی بونە کردوە! دواتر سوار هیچ بێرزونێك نەبو بەهەمان شێوە کەپێشتر سوار نەببو.

ئیلیا لەسەر دەستی ئەو دەستی بەسەردا گیرا و خەڵکەکەی لەسەردەستی ئەو پەیمانی ئاشتیان وەرگرت. دەستەیەك دەڵێن: گرتنی ئیلیا لەساڵی ١٦/ ٦٣٧ زایینی رویدا. ئەرتەبون و ئەو رۆمیانەی خوازیاری ئاشتی نەبون، بەرەو میسر کەوتنە رێ. کاتێك موسوڵمانان بونە فەرمانڕەوایی میسر، ئەویان کوشت. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو ڕۆشت بۆ رۆم. ئەو فەرمانڕەوایی صەوایف (خوراندنی زستانەی خەڵك و چوارپێکان) بو. ئەو و فەرمانڕەوایی صەوایفی موسوڵمانان روبەروی یەك بونەوە و هاورێ لەگەڵ موسوڵمانان پیاوێك بو لەقەیس کەپێیان دەوت زورمیس. ئەو دەستی پیاوی قەیسی بڕی و پیاوی قەیسی ئەوی کوشت. دواتر ئەم شێعرەی وت:

فان یك ارطبون الروم افسدها      فان فیها بحمدالله منتفعا

وان یك ارطبون الروم قطعها      فقد ترکت بها اوصاله قطعا

یانی: ئەگەر ئەرتەبونی رۆم دەستی بڕیم، سوپاس بۆ خوا چونکە سودێکی تیا بو.

## دانی بەخششەکان و بناغەدانانی دەبیرخانە

لەساڵی پانزەیەم/٦٣٦ زایینی، عومەر بۆ موسوڵمانان بەخششەکانی دیاری کرد و بناغەی دەبیرخانەی دانا. ئەو بەخششەکانی لەسەر بنەمای پێشینە بەخشی. بەصەفوان کوڕی ئومەییە و حارس کوڕی هشام و سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەناو ئەو کەسانی پێشینەی باوەڕداریان بو، کەمتر لەوەی بەخشی کەپێشینانی ئەوان وەریانگرتبو. ئەوان لەگرتنەکەی خۆیان بەدور گرت و وتیان: بەمە رازی نابین کەکەس بەرێزتر لەئێمە بێت. عومەر وتی: بەخششەکانی ئێوەم لەسەر بنەمای پێشینە لەباوەڕداری دیاری کردوە نەك لەسەر بنەمای نەژاد. وتیان: ئەگەر بەم شێوەیە، ترسمان نیە. وەریانگرت. حارس و سوهەیل لەگەڵ بنەماڵەکانی خۆیان بەرەو شام رۆیشتن و لەرێگای خوا بەردەوام شەڕیان دەکرد تا لەیەکێك لەو شەڕانە کوژران. دەستەیەك دەڵێن: لەتاعونەکەی عەمواس مردن.

کاتێك عومەر ویستی بناغەی دەبیرخانە دابرێژێت، عەلی و عەبدولرەحمان کوڕی

عەوف پێیان وت: لەخۆتەوە دەست پێبکە. وتی: نا لەمامی پێغەمبەر(ص)ەوە دەست پێدەکەم و دواتر نزیکتر و نزیکتر. سەرەتا بەخششی عەباسی دیاری کرد و لەعەباسەوە دەستی پێکرد. دواتر بەخششی بەبەدریەکان بەخشی و پێنج هەزار پێنج هەزار ناوی دەبرد. بۆ هەرکام لەشەڕکەرانی دوای بەدر تا ئاشتی حودەیبیە چوار هەزار چوار هەزار دیاری کرد. بۆ ئەوانەی دوای حودەیبیە تا شەڕی ئەبوبەکر لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان سێ هەزار سێ هەزار. لەناو ئەواندا کەسانێك بون لەگرتنی قادسیەدا بەشدار بون و لەلایەن ئەبوبەکرەوە شەڕیان کردبو و کەسانێك کە لەشەڕەکانی پێش قادسیە بەشدار بون. بەهەرکام لەوان سێ هەزار سێ هەزاری بەخشی. دواتر بۆ شەڕکەرانی شام و قادسیە دوهەزار دوهەزاری دیاری کرد و بۆ شەڕکەرە بەئەزمونەکان دوهەزار وپێنسەد دوهەزار و پێنسەد.

پێیان وت: باشترە ئەگەر شەڕکەرانی قادسیە بخەیتە ریزی شەڕکەرانی شەڕەکانی پێشوتر. وتی: ئەو کەسەنیم پێگەیەك بەوان ببەخشم کەهێشتا پێی نەگەیشتون. پێیان وت: لەدانی بەخششەکان، ئەوانەی ماڵەکانیان دورە لەگەڵ ئەوانەی لەناو ماڵەکانی خۆیان شەڕیان کردوە، وەك یەك حسێبت بۆ کردون. وتی: ئەوانەی ماڵیان لەدوژمنان نزیکتر بو، شیاوترن بۆ زیادە وەرگرتن چونکە ئەوان نیشانە و ئامانجی ترس و هۆکارێك بون بۆ ستەم کردنی دوژمنان. بۆ موهاجیرەکان کاتێك ئەوانمان لەگەڵ ئەنسار بەرابەر کرد، هیچیان نەوت. هاوکاری ئەنسار لەناو ماڵەکانیاندا بو و موهاجیرەکان درەنگتر پەیوەستی ئەوان بون.

بۆ شەڕکەران دوای قادسیە و یەرموك هەزار هەزاری دیاری کرد. بۆ سوارکاران (ئەسپ و ئێستر) پێنسەد پێنسەد و بۆ سوارکاران دوای ئەوان( ئەسپ و ئێستر و وشتر) سێسەد سێسەدی دیاری کرد. هەر چین و توێژێکی لەبەخششدا بەرابەر کرد: بەهێز و ناتەوان و عەرەب و عەجەم، هەمو بەرادەر و بەرابەر. بۆ سوارەکان (ئەسپ و ئێستر و وشتر و کەر) دوسەد و پەنجا. بۆ ئەوانەی دواتر بەخششی دیاری کرد و ئەوان خەڵکی هەجەر و عیباد بون کەدوسەدیان وەرگرت. چوارکەس کە لەشەڕی بەدر ئامادە نەبون، پەیوەستی ئەوانی کرد و بەخششەکانی خۆی پێبەخشین: حەسەن و حوسێن و ئەبوزەر و سەلمان. بۆ عەباس بیست و پێنج هەزار یا دوانزە هەزاری دیاری کرد. بەژنانی پێغەمبەر(ص)

دەهەزار دەهەزاری بەخشی مەگەر ئەوانەی هاوشێوەی کەنیزەکان بون. ژنانی پێغەمبەر(ص)ی خوا وتیان: پێغەمبەر(ص) لەبەخشینەکانی خۆی ئێمەی پێش ئەوان نەدەخست، تۆیش بەرابەری لەنێوان ئێمەدا رابگرە. ئەو ئەم کارەی کرد و دوهەزاری زیاتر بەعایشە بەخشی چونکە پێغەمبەر(ص) ئەوی زیاتر خۆش دەویست. عایشە بەشە زیادەکەی وەرنەگرت. ژنانی بەدری پێنسەد پێنسەدیان پێبەخشرا و ژنان دوای ئەوان تا حودەیبیە چوارسەد چوارسەد. ژنان دوای ئەوان تا شەڕەکانی پێش قادسیە سێسەد سێسەد و بەژنانی قادسیە دوسەد دوسەدی بەخشی. دواتر بۆ ژنان بەرابەری دەست نیشان کرد و بەهەمو منداڵەکان یەکسەد یەکسەدی بەخشی. دواتر شەست سواڵەکەری کۆکردەوە و نانی پێدان. خۆراکەکەی ئەوانیان بەراوەرد کرد و بینیان لەدو هەمانە دێتەدەر. لەبەر ئەمە بۆ هەرکام لەوان و بنەماڵەکانیان دو هەمانەی لەمانگدا دیاری کرد.

عومەر پێش مەرگی خۆی وتی: ئاهەنگی ئەوەم کرد بەخششەکان چوار هەزار چوار هەزار دیاری بکەم: هەزار بۆ ئەوەی پیاوی بیداتە بنەماڵەکەی خۆی، هەزار بۆ توێشو، هەزار بۆ ساز و بەرگ بۆ ئەوەی ئاسایشی زیاتر پێببرێت. ئەو گەورە پیاوە پێش ئەوەی ئەم کارە بکات، چاوی لەدنیا بەست.

یەکێك لەکاتی بەخشینی بەخششەکان پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، باشتر بو لەناو گەنجینەکاندا شتێکت پاشەکەوت دەکرد بۆ رۆژی تەنگانە یا بارودۆخێکی لەناکاو. وتی: وشەیەك بو دێو هێنایە سەرزمانی تۆ. خوا زیانەکەی لەمن دور بخاتەوە. ئەم کارە بۆ ئەو کەسانەی دوای من دێت، دەبێتە ئەزمونێك و گرفتاریەکی گەورە. بۆ ئەوان بەهەمان ئەندازە پاشەکەوت دەکەم کەخواوەند و پێغەمبەر(ص)ەکەی پاشەکەوتی کرد: فەرمانبرداری خواوەند و پێغەمبەر(ص)ەکەی. ئەم دو گەوهەرە گرانبایە پاشەکەوتی ئێمە بون و ئێمەیان گەیاندە ئێرە کەدەیبینیت. ئەگەر دارایی، بەهای باوەڕداری یەکێك لەئێوە بێت، لەناو دەچن.

عومەر بەموسوڵمانانی وت: من پیاوێك بازرگان بوم کەخوا بنەماڵەکەی منی بەبازرگانی بێ نیاز کرد. ئێوە منتان گرفتاری ئەم کارەی خۆتان کرد. بڕوانن، بزانن من لەم گەنجینەیە چیم پێ دەگات؟ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگ بو. خەڵك زۆریان وت.

وتی: ئەی عەلی تۆ چی دەڵێت؟ فەرموی: هەمان ئەندازە کەبەشی تۆ و بنەماڵەکەت بکات، نەزیاتر لەوە. ئەوان لەوتەکەی عەلی پشتیوانیان کرد. ئەو خواردنی خۆی هەلگرت بەلاّم نیازەکانی زیاتر بو و بارودۆخی روی لەدژواری کرد. دواتر دەستەیەك لەهاوەلاّنی پێغەمبەر(ص) وەك عوسمان و عەلی و زوبەیر و تەلحە کۆبونەوە و وتیان: باشترە بەعومەر بڵێین رۆژیەکەی خۆی زیاد بکات. عوسمان وتی: با ئێمە نیازەکانی ئەو بەشێوەیەك کەخۆی ئاگادار نەبێت، بەراوەردە بکەین. ئەوان رۆشتنە لای حەفصە و سەرەتا داوایان لێکرد ناو و نیشانی ئەوان بەنهێنی بهێڵێتەوە و بەعومەر نەڵێت. دواتر لێیان پرسی کەنیازەکانی عومەر کامانەن. حەفصە رۆشتە لای عومەر و لەمبارەوە پرسیاری لێکرد. عومەر وتی: ئەوانە کێن تا زیانیان پێ بگەیێنم؟ حەفصە وتی: هیچ رێگەیەك بۆ زانینی ناو و نیشانی ئەوان نیە. عومەر وتی: تۆ لەنێوان من و ئەوان پەیامەکان بگەیێنە. بڵێ، باشترین جل و بەرگ کەپێغەمبەر(ص) لەماڵەوە لەبەری دەکرد، کامە بو؟ حەفصە وتی: دو جل وبەرگ لەکەتان کە بەجوانی پاك و خاوێن کرابونەوە و پێغەمبەر(ص) لەکاتی هاتنی دەستەی نوێنەرایەتیەکان و لەکاتی کۆبونەوەکان، لەبەری دەکرد. عومەر پرسی: کام خواردنەی لەماڵەوە دەخوارد کەلەهەمویان باشتر بو؟ حەفصە وتی: نانی جۆ بەگەرمی کەرۆنم بەسەردا دەکرد و چەور و شیرینم دەکرد و دەیخوارد. عومەر پرسی: کام راخەرەی لەماڵەکەی تۆدا رادەخست کەزیاتر لەهەموان پەسەندی دەکرد؟ حەفصە وتی: راخەرێکی گەورە کەلەهاویندا چوارقەد مان دەکرد و کاتێك زستان دەهات نیوەیمان رادەخست و نیوەیمان دەدا بەخۆماندا. عومەر وتی: ئەی حەفصە، بەم کەسانە بڵێ، پێغەمبەر(ص) ژیانی بەسەر برد و دژواریەکانی بەگیان کڕی و زیادەکانی لەشوێنی خۆی دانا و بەئەندازەی پێویست بەسەندەی کرد. سوێند بەخوا بێ گومان زیادەکان دەخەمە شوێنی خۆی و ژیان لەسەر خۆم تەنگ دەکەم و بەئەندازەی پێویست بەسەندە دەکەم. داستانی من و دو هاورێکەم (پێغەمبەر(ص) و ئەبوبەکر) لەداستانی ئەو سێ پیاوە دەچێت پێکەوە رێگایەکیان دەبڕی. پیاوی یەکەم رێگەی خۆی گرتە بەر و چونکە توێشوی هەلگرتبو، بەئەنجام گەیشت. دواتر کەسی دوەم بەدوایدا رۆیشت و رێگاکەی ئەوی گرتەبەر و پەیوەستی بو. دوای ئەوانیش سێیەم کەس هەنگاوی نایە ئەو رێگا. ئێستا ئەگەر ئەم

بەرێگەی ئەواندا بڕوات و بەتوێشوی ئەوان بەسەندە بکات، بەوان دەگات و ئەگەر رێگەیەکی جیاواز بگرێتەبەر، لەگەڵ ئەوان جارێکیتر کۆنابێتەوە.

## شەڕەکان تا کۆتایی ئەم ساڵە شەڕەکانی بۆرس و بابل و کوسی

کاتێك سەعد لەقادسیە تەواو بو، دوای گرتنی ئەو ناوچەیە دومانگ لەوێ مایەوە و نامەی بۆ عومەر دەنوسی تا چ کارێك ئەنجام بدات. عومەر نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا بەرەو مەداین بڕوات و ژنان وکەسانی بنەماڵەکان و منداڵان لەعەتیق بەجێبێڵێت و سوپایەکی گەورە بکاتە هاورێی ئەوان و ئەم سوپایە تا ئەو کاتەی پاسەوانی ژن و منداڵی موسوڵمانان لەدەسکەوتەکان بکاتە شەریك. ئەو، ئەم کارەی کرد و چەند رۆژ بۆ کۆتایی مانگی شەوال/ سەرەتاکانی دێسامبەر ٦٣٦ زایینی لەقادسیەوە بەرێکەوت. لەو کاتەوەی خوا هەمو شتێکی سوپای فارسەکانی بەوان بەخشیبو، خەڵکان هەموبان بەجوانترین کەل وپەلەکانی شەڕ رازاوە بون. کاتێك پێشەنگەکان سوپای ئیسلام بەسەرکردایەتی عەبدالله کوڕی موعتەم و زوهرە کوڕی حەویە و شورەحبیل کوڕی سەمت گەشتنە شارستانی بۆرس، لەوێ بەصبۆهرا لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەئێرانیەکان روبەرویان بونەوە. موسوڵمانان ئەوانیان شکەستدا و بەرەو بابل پاشەکشێیان پێکردن کەلەوێ هەلاتوانی سوپای قادسیە لەگەڵ پاشماوەکانی سەرکردەکانی ئەوان وەك نەخیر خان و مێهران رازی و هورموزان وکەسانی دیکە رۆژگاریان بەسەر دەبرد. ئەوان فیروزانیان بەفەرماندەیی خۆیان هەڵبژاردبو. بەصبۆهرا هەلاتو و تێکشکاو لەبۆرس گەڕایەوە و کەوتە ناو روبار و لەئازاری ئەو شمشێرەی زوهرە لێیدابو، مرد. کاتێك بەسبۆهرا شکەستی خوارد، بەستام دێداری بۆرس هات و لەگەڵ زوهرە پەیمانی ئاشتی بەست و چەندین پردی بۆ هەڵبەست و ئەوی لەبارودۆخی ئەوانەی لەبابل کۆببونەوە، ئاگادار کردەوە. زوهرە پەیامی بۆ سەعد نارد و ئەم هەواڵەی پێدا. سەعد لەبۆرس رۆشتە لای و لەگەڵ پێشەنگەکان رەوانەی کرد و عەبدالله و شورەحبیل و مێرقال و هاشمی بۆ پشتیوانی ئەو نارد. ئەمان لەبابل لای فیروزان دابەزین. وتبویان: پێش ئەوەی بلاوەی لێبکەین، روبەروی ئەوان دەبینەوە. شەڕ دەستی پێکرد و موسوڵمانەکان ئەوانیان شکەستدا. هەلاتوان لەدو لاوە رایان کرد، هورموزان روی کردە ئەهواز و ئەو شارەی

گەمارۆدا و گرتی و فیروزان بەرەو نەهاوەند رۆیشت و ئەو شارەی کردە قەڵغانی خۆی و وێرانی کرد. گەنجەکانی خوسرەو لێرەدا بون. ئەو ماهینیشی وێران کرد. نەخیرخان و مێهران بەرەو مەداین رۆشتن و پردەکانیان وێران کرد.
سەعد لەبابل مایەوە. زوهەیر و پێش لەو بوکیر کوڕی عەبداللە لەیسی وکەسیر کوڕی شەهابی سەعدی بەرەو پێش ڕۆیشتن تا صەراتیان بڕی و پاشماوەی ئێرانیەکانیان دۆزیەوە کەفیومان و فەرخان لەناویاندا بون. بوکیر لەسەورە فەرخانی کوشت وکەسیر لەهەمان شوێن فیومان. زوهرە هات و سەورە بڕی و دابەزی. سەعد لەگەڵ هاشم و خەڵکانی دیکە گەیشتن و باریان خست. زوهرە بەرەو لای ئێرانیەکان پێشڕەوی کرد. ئەوان لەنێوان دەیر و کوسەی دابەزیبون. نەخیرخان و مێهران، شەهریاریان وەك جێگری خۆیان لەسەر سوپاکە دانابو. زوهرە ئاهەنگی شەڕی ئەوانی کرد وئەوان روبەروی بونەوە. زوهرە، ئەبو نەباتە نایل کوڕی جەشعەمی ئەعرەجی بۆ روبەروبونەوەی ئەو نارد. ئەو لەپیاوە ئازاکانی بەنی تەمیم بو. هەردوکیان ئەندامێکی گەورە و بازوی بەهێزیان هەبو. کاتێك شەهریار نایلی بینی، ڕمەکەی فڕێدا تا زۆرانی لەگەڵدا بگرێت. ئەبو نەباتەیش ڕمەکەی خۆی فڕێدا و پەلاماریدا. هەردو شمشێریان لەکالآن دەرهێنا و دەستیان بەلێدانی یەکتر کرد. ئەوان باوەشیان بەیەکدا کرد و لەئەسپەکانیان هاتنەخوار. شەهریار کەوتە سەر ئەبونەباتە وەك ئەوەی وشترێکی بەسەردا کەوتبێت. بەڕان وئەژنوی زەختی لێدەکرد و کێردەکەی خۆی دەرهێنا تا زرێکەی بقرتێنێت. پەنجەی لەدەمی ئەبو نایلە گیری کرد کەئێسقانەکەی شکاند. ئەبو نەباتە لاوازی و سستی لەو بینی و پەلاماریدا و ئەوی بەزەویدا کێشا. دواتر لەسەر سینەی دانیشت و کێردەکەی دەرهێنا و زرێکەی لەسەر سکی لابرد و کێردی لەسك و کەلەکەی چەقاند. ئەسپ و دەستبەند و ساز و بەرگەکەی ئەوی هەڵگرت و هاورێکانی شەهریار شکەستیان خوارد و لەشارەکاندا بلآوبونەوە. زوهرە لەکوسی مایەوە تا سەعد رۆشتە لای. زوهرە نایلەی بردە لای. سەعد کەل و پەل و دەستبەندەکەی شەهریاری پێبەخشی و ئەوی سوار بێرزونەکەی ئەو کرد و هەمو سامانە تالآن کراوکانی بەو بەخشی. ئەو یەکەم پیاوی ئەعرەجی (لەبەنی ئەعرەج) بو کەبازوبەندی زێرینی سەردارەکانی سوپای ئێرانی لەدەست کرد. سەعد چەند رۆژێك لەوێ مایەوە و سەردانی

مەزارگەی ئیبراهیمی خەلیلی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم شەڕانە لەساڵی ٦٣٧/١٦ زایینی رویدا.

## بەهرسیر یا شاری کۆنە یا شارە نزیکەکان لەلای رۆژهەڵات

دواتر سەعد زوهرەی رەوانە کرد و هاوڕێ لەگەڵ پێشەنگەکان رەوانەی بەهرسیر بو. شێر ئازاد کەدێداری سابات بو، بەئاشتی پێشوازی لێکرد. سەعد لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. زوهرە روبەروی دەستەی شەڕکەری پوران کچی خوسرەو بویەوە. ئەوان رۆژانە سوێندیان دەخوارد تا ئەو رۆژەی کەزیندوین، شاهەنشایی ئێران بەرەو لەناو چون ناڕوات. زوهرە ئەوانی شکەستدا و هاشم کوڕی عەتەبە برازای سەعد (گوارە لەگوێ) شێری دەست پەروەردەی خوسرەوی کوشت. سەعد سەری هاشمی ماچ کرد و هاشم پێی سەعد. سەعد ئەوی لەگەڵ پێشەنگەکان رەوانەی بەهرسیر کرد. ئەو لە (مەزلَم) دابەزی و ئەم ئایەی خوێند: ئایا پێشتر سوێندتان نەخواردبو کەهیچ کات روخان لەئارادا نیە؟ (ئیبراهیم/١٤/٤٤). بەرێکەوت و لەبەهرسیر دابەزی. موسوڵمانان و سەعد گەیشتن و ئەیوانیان بینی. زەرار کوڕی خەتاب وتی: خوا گەورەیە! ئەمە کۆشکە سپیەکەی خوسرەو! ئەمە ئەو شتەیە خوا و پێغەمبەر(ص)ەکەی مژدەی بەئێمە داوە. ئەو تەکبیری وت وخەڵك تەکبیریان وت. هەرجار کەدەستەیەك دەگەیشت، خەڵك هەموی تەکبیریان دەوت. دواتر لەقەراغەکانی شار دابەزین. دابەزینیان لێرە لەزی حەجە/ژانویەی ٦٣٧ زایینی بو.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. فەرماندارەکانی ئەو لەشارەکان ئەمانە بون: لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید (بەوتەی هەندێ کەس) لەتایف یەعلی کوڕی مونیە، لەبەحرەین و یەمامە عوسمان کوڕی ئەبی عاص، لەعەمان حوزەیفە کوڕی میحصەن، لەشام ئەبو عوبەیدەی جەراح، لەکوفە وسەرزەمینەکانی دەوروبەری سەعد کوڕی ئەبی وەقاص و لەبەصرە موغیرە کوڕی شەعبە.

لەم ساڵەدا( و بەوتەی هەندێ کەس لەخەلافەتی ئەبوبەکر)، سەعد کوڕی عەبادەی ئەنصاری مرد و ئەوفل کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیبیش. ئەمەیان پیرترین پیاوی بەنی هاشم بو کەباوەڕی هێنا.

## روداوەکانی ساڵی شانزەیەمی کۆچی (٦٣٧ زایینی)

## دەست بەسەردا گرتنی شارەکانی رۆژئاوا یانی بەهرسیر

لەم ساڵەدا لەمانگی صەفەر / مارسی ٦٣٧ زایینی موسوڵمانان رۆشتنە ناو شاری بەهرسیر. سەعد پێشتر گەمارۆیدابو. ئەو سوارە بەئەزمونەکانی رەوانە کرد و سوارەکان هێرشیان کردە سەر ئەو کەسانەی پەیمان نامەی ئاشتی ئەوانی نەدەگرتەوە و تالآنیان کردن. سوپای ئیسلام سەد هەزار وەرزێری بەئەسیری گرت، هەر کامیان یەك کەسیان گرت چونکە سوپای ئیسلام هەمویان سوارە بون. سەعد پەیامی بۆ عومەر نارد و داوای فەرمانی لێکرد. عومەر وەڵامی دایەوە: ئەو وەرزێرانەی هاوکاری دوژمنیان نەکردوە و لای ئێوە نەسیرن، ئەم هاوکاری نەکردنە بۆ ئەوان وەك ئەمان بێت. هەر کەس هەڵات، شوێنی کەون و بیگرن، خۆت ئەزانی چیان لەگەڵدا بکەیت. سەعد ئەوانی ئازاد کرد و پەیك و پەیامی بۆ لای دێدارەکان رەوانە کرد و پێشنیاری باج، ئیسلام یا شەڕی پێکردن. ئەوان گەڕانەوە و ئەو کەسانەی لەبنەماڵەی خوسرەو بون، بەم کارە رازی نەبون. لەرۆژئاوای دیجلە تا سەرزەمینەکانی عەرەب کەس لەخەڵکانی سواد نەمایەوە مەگەر ئەوەی نەمانی پێدرا و هەمویان لەفەرمانڕەوایی ئیسلام شاد و سەربڵند بون.

سوپای ئیسلام دو مانگ لەشارەکانی بەهرسیر مانەوە و بە تۆپ هاوێژەکان، گۆی ئاگرینیان بەسەردا باراندن و بەقەڵغانە گەورە و قورسەکان (شتێك هاوشێوەی دەبابەکانی ئەمڕۆ) هێرشیان دەکردە سەر ئەوان و بەهەمو توانای شەڕکردنی خۆیان، شەریان لەگەڵ دەکردن. بیست تۆپ هاوێژیان جێگیر کرد و ئەوانیان بەم کارە گرفتار کرد. دوایین کاریان ئەوەبو بەدڵ وگیان دەستیان بەشەڕ کرد و لەسەر خۆڕاگری لەگەڵ یەك پەیمانیان بەست. موسوڵمانان روبەرویان بونەوە. زوهرە کوڕی حەویە زرێیەکی دڕاوی لەبەردابو. پێیان وت: چی دەبێت ئەگەر ئەم دڕاوی چاك بکەیتەوە. وتی: ئەگەر تیرێك لەلایەن ئێرانیەکانەوە بێت و لەهەمو سوپاکە تێپەر بکات و لەم کونەوە لەجەستەی من بچەقێت، من لای خوا زۆر بەرێز دەبم کەبەمشێوەیە گیانم دەستێنێت. ئەو یەکەم کەس لەموسوڵمانان بو، بو بەنیشانەی زوبینێك کە لەهەمان کونەوە

لەجەستەی چەقی. یەکێك وتی: زوبینەکە دەرکێشن. زوهرە وتی: وازم لێ بێنن تا ئەم زوبینە لەجەستەی مندا بێت، گیان هاوڕێی جەستەمە. ئەگەری هەیە بتوانم بەم زوبینە گیانبڕە، شمشێر یا ڕمێك لەدوژمن بوەشێنم. ئەو بەرەو دوژمن ڕۆشت و بەشمشێرەکەی خۆی یەکێك لەشەهریارانی ئیستەخری کوشت. ئێرانیەکان گەمارۆیاندا و کوشتیان و بلاوەیان لێنەکرد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم زوهرەیە تا ڕۆژگاری حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی مایەوە و شەبیبی خارجی ئەوی کوشت. دواتر ئاماژەی پێدەدین.

گەمارۆدان بەئەندازەیەك گرفتاری بۆ شارەکانی ڕۆژئاوا دروست کرد کەپشیلە و سەگەکانیان خوارد و لەزەحتی گەمارۆدان کەوتنە دژواریەکی مەترسیدارە. لەم کاتەدا کەئەوانیان گەمارۆدابو، نێردراوی پاشا ڕۆیشتە لای ئەوان و وتی: ئایا خوازیاری ئاشتی هەن؟ ئاشتی لەسەر ئەو بنەمایە بێت ئەوەی لەدیجلەوە تاکوێستانی ئێمەیە، بۆ ئێمە بێت وئەوەی لەدیجلەوە تا کوێستانی ئێوەیە، بۆ ئێوە بێت. ئایا تێر نەبون؟ خوا ئێوە تێر نەکات؟ ئەبو موفەزەر ئەسوەد کوڕی قوتبە بەفەرمانی خوا کەوتە قسە و چەندین وتەی هێنایە سەر زمان کەئەخۆی زانی چیە و نە هاوڕێکانی. پیاوەکە گەڕایەوە. ئەوان دیجلەیان تا شارستانەکانی ڕۆژهەلاتیان بڕی کەئەیوان لەناویاندابو. هاوڕێکانی پێیان وت: ئەی ئەبو موفەزەر، چیت بەوان وت؟ وتی: سوێند بەو کەسەی محەممەدی بەراستی و دروستی ناردوە، نازانم چیم وت و هیوادرام وتەیەکی چاکەم هێنابێتە سەرزمان. سەعد و خەڵك لەویان پرسی چی هێناوەتە سەرزمان و نەیتوانی بیری بێنێتەوە. سەعد لەناو خەڵکەکەی خۆی هاواری کرد وئەوان رویان لەئێرانیەکان کرد بەلام کەس لەشارەکە دەرنەکەوت و هیچ کەس نەهاتەدەر مەگەر پیاوێك کەداوای ئەمانی کرد.ئەمانیان پێدا و وتی: لەشاردا کەسی لێ نیە روبەروی ئێوە ببێتەوە. هاتنە ناوشار و هیچ کەسیان جگە لەچەند ئەسیرێك و ئەو پیاوە نەبینی. لێیان پرسی: بۆ خەڵکی شار رایان کردوە؟ وتی: پاشا کەسی بۆ لای ئێوە نارد و پێشنیاری ئاشتی پێدان بەلام ئێوە وەلامتان دایەوە کە: لەنێوان ئێمە و ئێوە ئاشتی لەئارادا نەبێت تا هەنگوینی فەرەیدون بەتورەنجی کوسیەوە بخۆین. پاشا وتی: ئەی هاوار! فریشتەکان لەسەر زمانی ئەوانەوە قسە دەکەن و وەلامی ئێمە دەدەنەوە.

ئەوان تا قوڵایی شارستانەکان ڕۆشتنە پێش. کاتێك ڕۆشتنە ناو شارەکان، سەعد ئەوانی لەناو ماڵەکاندا نیشتەجێ کرد. ویستیان بەمەدایندا تێپەڕن، بەڵام بینیان ڕێگاکان لەمەداینەوە تاتکریت بەسەختی بەستراون و پارێزگاریان لێدەکرێت.

## گرتنی مەداینێك کەئەیوانی خوسرەو لەوێیە

گرتنی مەداین لەصەفەری ساڵی ١٦/مارسی ٦٢٧ زایینی رویدا. دەڵێن: سەعد چەند رۆژێکی لەمانگی سەفەری ئەم ساڵەی لەبەهرسیر بەسەر برد. لەم کاتەدا پیاوێکی گەورە وبەهێز هات وئەوی بۆ ژێرئاوێك رێنوێنی کرد کە لەقوڵایی سەرزەمینی ئێرانیەکان دەهاتەدەر. سەعد خۆی لەم کارە دورخستەوە و لەئەنجامدانی ئەم کارە درەنگی کرد. لە کاتی بەرزبونەوەی ئاوی دەرا هێرشی کردە سەر ئەوان. لەو ساڵەدا دیجلە بەردەوام دەخرۆشا و کەفی دەهێنایە سەر لێو. پیاوی بەهێز هات و وتی: چ شتێك بۆ درەنگ کردن ناچارت دەکات؟ سێ رۆژ تێناپەڕێت کەیەزدگێرد هەمو سامانەکانی مەداین دەباتەدەر. ئەم قسەیە ئەوی بۆ تێپەر کردن هاندا. کەسێك لەناو ئەوان خەوی بینی کەئیسلامیەکان لەئاوی دیجلەیان داوە و تێپەڕیون. سەعد مەبەستی ئەوەی کرد ئەو خەوە بکاتە راستی. خەڵکی کۆکردەوە و لەناو ئەواندا بۆ وتارێکی خوێندەوە. سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: دژومنانی ئێوە لەم دەریادا خۆیان حەشارداوە. بەبونی ئەم دەریایەوە ئێوە ڕێگەیەك بۆ لای ئەوان نادۆزنەوە بەڵام ئەوان هەر کات بیانەوێت بەکەشتیەکانی خۆیان بەرەو ئێوە دێن و شەڕتان لەگەڵ دەکەن. بەڵام لەپشت سەری ئێوە زیانێك نیە لێی بترسن. شەڕکەرانی شەڕەکانی پێشو رێگەیان بۆ ئێوە تەخت کردوە و سنورەکانی ئەوانیان ئیفلیج و لەکاریان خستوە. بۆچونم وایە پێش زیان بەرکەوتن لەلایەن ئەم دەریاوە، روبەروی ئەوان ببنەوە. من دەمەوێت ئەم دەریا ببڕم و خۆم بەوان بگەیێنم و شەڕیان لەگەڵ بکەم.

هەمویان وتیان: خواستی خوا بۆ ئێمە و تۆ بەختەوەری و سەرکەوتن بێت، ئەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدە. داوای لەخەڵك کرد تێپەڕن و وتی: کێیە پێشڕەوی دەست پێبکات و دەروازەی روبارەکە ببەستێت و بەرگری لێبکات تا کەسانیتر بتوانن تێپەڕن و دوژمنان رێگر نەبن لەتێپەڕبونی ئەوان؟ عاصم کوڕی عەمرۆ، ئەو پیاوە چوارشانە و

بەهێزە لەگەڵ شەشسەد شەڕکەری بەئەزمون هەنگاویان بردە پێش. سەعد عاصمی بەفەرماندەیی ئەوان دیاری کرد. عاصم لەگەڵ شەست سوار لەپێش ئەوانەوە بەرێکەوت و ئەوانی سوار ئەسپی نێر و مێ کرد تا کار بۆ مەلە کردنی ئەسپەکان ئاسانتر بێت. رویان کردە روباری دیجلە. کاتێك ئێرانیەکان ئەوان و کاری ئەوانیان بینی، بەئەندازەی ئەو ئەسپانەی هاتبونە پێش، ئەسپیان خستەناو ئاوەکە و لەناو دیجلە هێرشیان کردە سەریان. روبەروی عاصم بونەوە کەلەقەراغی روبارەکە نزیك کەوتبویەوە. عاصم هاواری کرد: ڕم، ڕم! ڕمەکان بهاوێژن و چاویان بکەنە نیشانە. هەردو لای شەڕکەر روبەروی یەك بونەوە و بەردەوام ڕمیان بۆ یەك دەهاویشت. موسوڵمانان چاوی ئەوانیان کردە نیشانە و دوژمنان هەڵاتن و موسوڵمانان خۆیان بەوان گەیاند و شمشێریان خستە ناویان و کوشتاریان کردن. هەر کەس لەوان رزگاری بو، بەیەك چاو گەڕایەوە چونکە ڕم لەچاوی چەقیبو. ئەو شەشسەد پیاوە پەیوەستی ئەو شەست کەسە بون بێ ئەوەی توشی رەنج و زیان ببن.

کاتێك سەعد بینی عاصم لەلێواری روبارەکە نزیك بۆتەوە و دەیپارێزێت، فەرمانی بەخەڵکدا هێرش بەرن. وتی: بڵێن تەنیا لەخوا هاوکاریم دەوێت و کارەکانی خۆم بەو دەسپێرم. خوا بۆ ئێمە بەسە و باشترین پارێزەر و پشتیوانە. سوێند بەخوا بێ گومان خواوەند هاورێکانی خۆی هاوکاری دەکات و بێ گومان دینەکەی خۆی سەرکەوتو و دوژمنانی خۆی شکەست دەدات. هیچ تاقەت و توانایی و توێشویەك نیە مەگەر ئەوەی بەخشینی خوای گەورە بێت. خەڵك بەدوای یەك ڕۆشتنە ناو دیجلە و بەشێوەیەك لەگەڵ یەك دەدوان وەك بڵێی لەوشکانیدان. بەشێوەیەك سەراسەری دیجلەیان داپۆشی کە لەکەنارەکانەوە هیچ شتێك نەدەبینرا. ئەوەی هاوڕێ و هاوجڵەوی سەعد بو، سەلمانی پاکی فارسی بو. ئەسپەکانی ئەوان تا ملیان لەناوەکەدا بو و سەعد بەردەوام دەیوت: خوا بۆ ئێمە بەسە وباشترین پارێزەر و پشتیوانە. سوێند بەخوا بێ گومان خوا هاوکاری هاورێکانی خۆی دەکات و دینەکەی خۆی سەرکەوتو و دوژمنانی شکەست دەدات ئەگەر نا لەناو سوپاییەکان روسپیەکی بێدادگەر یا گوناحکارێك بێت کەگوناحەکانی ئەو چاکەکان پێشێل بکات. سەلمان پێی وت: ئیسلام ئایینێکی تازەیە، دەریاکان بەشێوەیەك رام و دەستەمۆی موسوڵمانان بون کەوشکانیەکان. سوێند بەو کەسەی گیانی سەلمان

لەدەستی ئەودایە، دەستەکان بەتەندروستی لێی دەڕۆنەدەر بەهەمان شێوە کەدەستەکان ڕۆشتنە ناوی. ئەوان بەهەمان شێوە کەسەلان وتبوی، لەئاوەکە هاتنەدەر و کەمترین شتیان لەدەست نەدا جگە لەوەی پیاڵەك لەدەستی مالك کوڕی عامری عەنبەری کەوتە خوار و زەحتی ئاوەکەی لەگەڵ خۆیدا بردی. ئەو کەسەی هاوڕێی ئەو بو، وەك سەرکۆنەکردن وتی: چارەنوس لێی ئالا و لەگەڵ خۆیدا بردی. مالك وتی: سوێند بەخوا لەحالەتێکدام کەخوا لەناو دوسوپای گەورە، پیاڵەکەی من لەمن ناستێنێت. کاتێك تێپەڕین، ئاو پیاڵەکەی بۆ کەناربرد ویەکێك لەخەڵکان ناسیەوە و رادەستی مالکی کردەوە. کەس لەوان لەئاودا نەخنکا جگە لەپیاوێك بەناوی غەرقەدە کە لەئەسپە مو سورەکەی خۆی خزا بەلام قەعقاع جڵەوی ئەسپەکەی خۆی بۆ لای ئەو سوراند تا بیگرێت و ئەوی بەدەستی خۆی گرت و تەندروست هێنایەدەر. خەڵك تەندروست لەئاو هاتنەدەر و ئەسپەکان یاڵەکانی خۆیان لەئاو دەتەکاند. کاتێك ئێرانیەکان ئەم کارەیان بینی و روبەروی دیاردەیەك بونەوە کە لەبەرچاویان نەگرتبو، بەهەلاتن رویان لەحلوان کرد. یەزدگێرد پێش ئەوان بەحلوان گەیشت و مێهران و نەخیرخانی وەك جێگری خۆی دەست نیشان کردبو. ئەو سەرپەرەستی گەنجخانەکانی نەهرەوان بو. ئێرانیەکان ژنان و منالەکانی خۆیان و (تا ئەو شوێنەی دەیانتوانی) باشترین و سوکترین کالاکانی خۆیان هەلگرتبو و لەگەنجخانەکان لەجل و بەرگ و کالا و دەفر و گەوهەرەکان و راخەرەکان وجل و بەرگە گرانباییەکان ئەوەندەیان بەجێهێشتبو کەکەس نەیزانی بەهاکەیان چەندە. لەگەنجخانەکان سێ هەزار هەزار هەزار (درەم یا دینار)یان دۆزیەوە کە ڕۆستەم لەکاتی هاتنی بۆ قادسیە نیوەی هەلگرتبو و نیوەی بەجێهێشتبو.

یەکەم دەستەی شەڕکەر کەرۆشتە ناو مەداین، (دەستەی مەترسیدار) یانی دەستەی شەڕکەری عاصم کوڕی عەمرۆ و بەدوای ئەو ( دەستەی خامۆشان) یانی دەستەی شەڕکەری قەعقاع کوڕی عەمرۆ بو. شەڕکەرەکان ڕۆشتنە قولایی کۆلانەکان و کەسیان نەدۆزیەوە لێی بترسن جگە لەوانەی لەناو کۆشکی سپیدا بون. ئەوانیان گەمارۆدا کە لەسەر بنەمای دانی باج و وەرگرتنی ئەمان هاتنەدەر. خەڵکی مەداین بەهەمان شێوەی خۆیان بۆ شار گەڕانەوە و هیچ نیشانەیەکیان لەبنەماڵەی خوسردو نەبینی.

سەعد لەکۆشکی سپی دابەزی و زوهرەی بەدوای هەڵاتوانی نەهرواندا رەوانە کرد و بەم ئەندازەیە بۆ هەر لایەك. سەلمانی فارسی پێشەنگ و بانگێشتەکەری موسوڵمانان بو. سێ جار خەڵکی بەهرسیر و سێ جار خەڵکی کۆشکی سپی بۆ ئیسلام بانگێشت کرد. سەعد (ئەیوانی خوسرەوی) بۆ نوێژ کردن (نوێژگە) هەڵبژارد و هیچ کام لەپەیکەرەکانی ئەوێی نەگۆڕی. لەمەداین شتێکی سەرسوڕهێنەرتر لەتێپەڕ کردن لەناو روینەدا. ئەو رۆژەیان بەرۆژی (تەپۆڵکەکان) ناو برد. کەس بەدوای هیچ شتێکدا نەدەگەڕا مەگەر ئەوەی تەپۆڵکەیەکی گەورەی خاك لەسەر زەوی بۆ ئەو سەری هەڵدەدا و ئەوی لەو ناوەی تا ملی ئەسپەکەی داپۆشیبو، دەحەساندەوە. لەمبارەوە بو ئەبو بوجەید نافع کوڕی ئەسوەد وتی:

و اسلنا علی المدائن خیلا بحرها مثل برهن اریضا

فانتثلنا خزائن المز کسری یوم ولوا و خاض کمها جریضا

یانی: ئەسپەکانمان لەناو شاری مەدائیندا غارپێدا، دەریایی ئەوێ وەك وشکاییەکەی چاوی دەلاواندەوە. ئەو رۆژەی ئەوان هەڵاتن، ئەو بەقورگێکی گیراو لەخەم، خۆی خستە ناو ئاوەکە.

کاتێك سەعد ڕۆیشتە ناو ئەیوانی خوسرەو، ئەم ئایانەی خوێند: چەندە فراوان رەز و بێستان و کێڵگە و شوێنی خۆش و دلگیریان لەدوای خۆیان بەجێهێشت. ئەو بەخشینانەی تیادا نوقم بون و کەڵکیان لێ وەردەگرت. بەمشێوە بو ئەوانەمان کردە شتێکی کەمبایی و بەخەڵکانی دیکەمان بەخشی (دخان/٤٤/٢٥—٢٨). ئەو لەوێ نوێژی سوپاسی بۆ سەرکەوتنەکانی خوێند. هەشت رەکەعەتی خوێند بێ پچڕان. بەجەماعەت نەیخوێند.. بەتەواوی خوێندی چونکە ئەندێشەی مانەوەی لەدڵدابو. یەکەم هەینی بو لەعێراق بەسەر دەبرا. نوێژی هەینیان لەمانگی صەفەری ساڵی ١٦/مارسی ٦٣٧ زایینی خوێند.

کاتێك موسوڵمانان بەدوای ئەواندا ڕۆیشتن، یەکێك لەموسوڵمانان روبەروی پیاوێکی ئێرانی بویەوە کەپارێزگاری هاوەڵانی خۆی دەکرد. ئەسپەکەی خۆی غاردا تا هێرش بکاتە سەر موسوڵمانەکە، بەڵام دودڵ بو و ئاهەنگی هەڵاتنی کرد بەڵام نەیتوانی. پیاوی موسوڵمان ئەوی گرت و کوشتی و هەمو کەل و پەلەکانی هەڵگرت. پیاوێکی موسوڵمانی

دیکە روبەروی دەستەیەك لەئێرانیەکان بویەوە کەیەکتریان بۆ خۆراگری نەکردن سەرکۆنە دەکرد. بۆ یەکێك لەوان نیشانەیەکیان دانابو کەتیری دەهاویشت و تیرەکانی بەهەڵەدا نەدەچون. گەڕانەوە و ئەم پیاوە موسوڵمانە روبەرویان بویەوە. ئەو ئێرانیە لەشوێنێکی نزیکتر موسوڵمانەکەی کردە نیشانە بەڵام تیرەکەی بەهەڵە رۆیشت. موسوڵمان خۆی پێگەیاند و کوشتی و هاوەڵانی رایان کرد.

## تاڵانیە کۆکراوەکان لەمەداین و چۆنیەتی دابەش کردنیان

سەعد بۆ داراییە تاڵانیەکان عەمرۆ کوڕی عەمرۆ موقرەنی دیاری کردبو وبۆ بەش کردنی ئەوان سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی. ئەو هەموی ئەو شتانەی لەناو کۆشك وئەیواندابو کۆکردەوە و هەمو داواکاریەکانی لەبەر چاو گرت. خەڵکانی مەداین لەکاتی هەڵاتن ئەو شوێنانەیان تاڵان کردبو و هەرکام بۆ لایەك رایکردبو. هیچ کام لەوان بەو شتانەوە نەیانتوانی رابکەن مەگەر ئەوەی دەستیان بەسەرداگیرا و لێیان وەرگیرایەوە.
لەمەداین چەندین ماڵی گومەز ئاسایان لەشێوەی تورکی و لێوانلێو لەسەوەتەکان بینی کە بەمس قوفڵیان کردبون. ئەوانەیان بەخۆراك زانی و بینیان لێوانلێوە لەدەفری زێرین و سیمین.
هەندێ کات دەبینرا پیاوێك لەشاردا دەسوڕایەوە تازێر لەبەرابەر زیودا بفرۆشێت.
ئەندازەیەکی بەرچاویان کافور بینی و بەخوێیان زانی و لەگەڵ هەویر تێکەڵیان کرد و نانیان لێکرد بەڵام نانەکە تاڵ بو.
ئەو کەسانەی لەگەڵ زوهرە بون، دەستەیەك لەئێرانیەکانیان لەسەر پردی نەهرەوان بینی کەلەوێ کۆبونەتەوە و دەیانەوێت تێپەڕن. ئێسترێك لەوان کەوتە ناو ئاوەکە، پەلەیان کرد و خۆیان هەڵدایە سەری. یەکێك لەموسوڵمانەکان وتی: نهێنیەك لەکاری ئەم ئێسترەدایە. موسوڵمانان لەسەر ئەو ئێسترە روبەرویان بونەوە. گرتیان و بینیان کەرەستەکانی رازاندەوە و ئارایشتی خوسرەوی تیایە: جل و بەرگەکان، گەوهەرەکان، زرێ گەوهەردارەکان و هتد. ئەو بەو هەمو رازاندنەوەیە، بۆ خۆ نواندن، لەناو کۆڕەکاندا دادەنیشت.
پیاوێك بەناوی کەلەج دو ئێستری بەدو ئێرانی بینی کەهەردوکیانی کوشت و

ئێسترەکانی گرت و تەسلیمی بەرێوبەری کۆکەرەوەی سامانەکانی کرد. ئەو سەرقاڵی نوسین و پێرست کردنی ئەو شتانە بو کەپیاوە شەرکەرەکان دەیانهێنا. یەکێك پێی وت: چاوەڕی بە بزانم چیت پێیە. پیاوەکە بارەکانی لەئێسترەکە داگرت وبینی لەیەکێك لەوان دو سەبەتەی تیایە کەتاجی گەوهەر ناسای خوسرەوی تیا دانراوە. ئەو ئەم تاجەی بەردەوام بەشتێك لەسەر سەری رادەگرت چونکە گەوهەرەکانی گەورە و قورس بون. باری ئێسترەکەی دیکە جلەکانی خوسرەو بون. ئەو جل و بەرگی رازاوە بەگەوهەر و جل و بەرگی بەزێرچنراوی و رشتەی گەوهەردار دەپۆشی.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ ئێرانیەکی بینی و کوشتی و دو جانتای لێگرت کەلەیەکێك لەوان پێنج شمشێر و لەیەکیتریان دەستەیەکی شەشی لەشمشێر و زرێکان بون کە زرێی خوسرەو و خودەکانی ئەو و زرێی هراکلیوس و زرێی خاقان پاشای تورکەکان و زرێی داهر پاشای هندوستان و زرێی بەهرامی چوبین و زرێی سیاوەخش و زرێی نەعمانی تیابو. ئەم زرێیانە ئێرانیەکان لەکاتی هێرشی داهر و خاقان و هراکلیوس لەوانیان بەدەست هێنابو. لەنەعمان و بەهرامی چوبین کاتێك زرێکانیان وەرگرتبو کەلەبەرابەر خوسرەو رایان دەکرد. شمشێرەکان بەمشێوە بون: شمشێری خوسرەو، هورموز، قوباد، فیروز، هراکلیوس، خاقان، داهر، بەهرام، سیاوەخش و نەعمان. قەعقاع ئەمانەی بردە لای سەعد. سەعد سەرپشکی کرد تا یەکێك لەشمشێرەکان بۆ خۆی هەڵگرێت. ئەو شمشێری هراکلیوسی هەڵگرت. سەعد زرێکەی بەهرامیشی پێبەخشی و ئەوانیتری لەناو دەستەی شەرکەری خامۆشان دابەش کرد. ئەو شمشێری نەعمان و خوسرەوی هەڵگرت و رەوانەی لای عومەری کرد تا عەربەکان ببینن و ناوبانگی چاکەی ببیستن. ئەم دو شمشێرەیان لەناو پێنج یەکەکە جێکردەوە. تاج و ساز و بەرگە رازێنەرەکان و جلەکانی خوسرەویان بۆ عومەر نارد تا موسوڵمانان ببینن.

عصمە کوڕی خالید دو پیاوی لەگەڵ دو کەردا بینی. یەکیانی کوشت و ئەویترین هەڵات. کەرەکانی هەڵگرت و بردیە لای بەرێوبەری کۆکردنەوەی سامانەکان. یەکێك لەکەرەکان دو سەوەتە باری پێبو. ئەسپێکی زێڕین بە زین و هەوساری زیوین. لەسەر کۆپان و دەوروبەری گەردنی دەنکەکانی یاقوت و زەمورود بو کە بەڕشتەی زیوین پەیوەستی یەك کرابون. تیایدا سوارەیەکی زیوین و گەوهەرنیشان دانرابو بو. لەسەوەتەیەکی تر

وشترێکی زیوین بە کۆپان و هەوساری و جڵەوی زێڕین و گەوهەر نیشان دیاری کرابو. سوارەکەی، پیاوێکی زێڕێن و رازاوە بەگەوهەرەکان دەبینرا. خوسرەو ئەمانەی لەسەر تاجەکەی خۆی دادەنا.

پیاوێکی دیکە هات و قوتوێکی بەبەرێوبەری وەرگری سامانەکانی دا. ئەو و هاورێکانی وتیان: هەرگیز هاوشێوەی ئەمەمان نەبینیوە و هەموی ئەوەی هەمانە، نەدەتوانێت بەرابەری بکات نەبەهاکەی لێی نزیك دەبێتەوە. وتیان: ئایا لەم قوتوە هیچت هەلگرتوە؟ وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بۆ خوا نەدەبو، نەمدەهێنا بۆ لای ئێوە. پرسیان تۆ کێیت؟ وتی: سوێند بەخوا ئێوە لەناو و نیشانی خۆم ئاگادار ناکەمەوە تا بەگەورەم بزانن. من سوپاسی خوا دەکەم و تەنیا داوای پاداشت لەو دەکەم. ئەوان پیاوێکیان بەدوایدا نارد و بینیان ئەو عامر کوڕی عەبد قەیسە. سەعد وتی: سوێند بەخوا سوپاییەکان پیاوانێکی ئەمینن و ئەگەر بەو شێوەیە نەبوایە کەلەپێشی شەڕکەرانی بەدر پێشتر سەلێنرابو، دەموت ئەمان لەبەدریەکان لەپێشترن. تەنانەت من لەوان چەندین هەڵەم بینی کە لەناو ئەماندا ناتوانم گومانی لێ بکەم.

جابر کوڕی عەبدالله وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نیە، ئێمە هیچ کام لەشەڕکەرانی قادسیەمان نەبینی کەئەم دنیا و ئەو دنیایی بوێت (یا: ئەم دنیایی لەگەڵ ئەو دنیادا بوێت). گومانی خراپەمان لەسێ کەس کرد و بینیمان بۆ ئەمانەت و خۆپارێزی وێنەیان نیە. ئەوان ئەمانە بون: تولەیحە، عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب و قەیس کوڕی مەکشوح. کاتێك شمشێر و کەمەربەند ئارایشتە زێرینەکانی خوسرەویان بردە لای عومەر، وتی: ئەو خەڵکانەی ئەمانەیان تەسلیم کردۆتەوە، ئەمیندارن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: چونکە تۆ خواترس و دیندار و داوێن پاکیت، خەڵکان داوێن پاکن.

کاتێك تالانیەکان لای سەعد کۆکرانەوە، سەرەتا پێنج یەکی لێ جیا کردەوە و دواتر تالانیەکانی لەناو سوپاکەی کەشەست هەزار کەس بون، دابەش کرد. هەر سوارەیەك دوانزە هەزاری بەرکەوت. هەمویان سوار بون و هیچ کەسیان پیادە نەبو (هەموی ئەوەی سوپاکە وەریان گرت ٧٢٠ میلیۆم درەم یا دینار بو). لەپێنج یەکەکان بەو شەڕکەرانەی بەخشی کەئازایانە شەڕیان کردبو و چەندین جار گیانی خۆیان خستبویە

مەترسیەوە. ماڵەکانی بەخەڵکان بەخشی تا لەوێ نیشتەجێ ببن. بنەماڵەکانی کۆکردەوە و ئەوانی نیشتەجێ کرد. ئەوان لەمەداین مانەوە تا سوپای ئیسلام لەکاری شەڕی جەلەولا و حلوان و تکریت و موسل تەواو بون و دواتر بەرەو کوفە بەرێکەوتن. سەعد هەمو ئەو شتانەی دەیویست عەرەبەکانی پێ سەرسام بکات، لەناو پێنج یەکەکان داینا، هەروەها ئەو شتانەی موسوڵمانان لەبەدەست هێنانی شادمان دەبون. دەیویست پێنج یەکی (قتف) یا (قەتیف) (جل و بەرگی رازاوەی خەو) دیاری بکات بەڵام دابەش کردنی ئەوان دژوار بو. ئەمە هەمان بەهارستانی خوسرەو بو. بەموسوڵمانانی وت: ئایا لەدڵ و گیان لە چوار پێنجەکەی چاو دەپۆشن تا بۆ عومەری بنێرێت؟ ئەمە لەناو ئێمەدا شیاوی دابەش کردن نیە. جیاواز لەوە، لەناو خەڵکانی مەدینە، زۆر بەهادار دەبێت. وتیان: ئەو کارە بکە. ئەو بەهارستانی بۆ عومەر نارد. ئەم بەهارستانە، راخەرێك بو بەدرێژی شەست گەز و پانی شەست گەز (٣٦٠٠ گەزی چوار گۆشە) بەرابەر بەیەك جەریب ( گەریب یا جەریب بەرابەرە لەگەڵ ١٠٠٠٠ گەزی چوارگۆش. خوسرەوان ئەم فەرشە گرانبایییەیان بۆ زستانانی خۆیان هەڵدەگرت و کاتێك گوڵ و سەوزی نەدەما، لەسەر ئەو فەرشە شەرابیان دەخواردەوە. وەك بڵێی لەناو گوڵستانێکدا بەسەر ببەن. تیایدا رێگاکای هاوشێوەی روبار و رشتەی گەوهەرەکان وەك جۆگەلە، تەختەکەی بەزێرچنرابو و لەناویدا دەنکە گەورەکانی مروارید. کەنارەکانی لەزەوی کێڵدراو دەچو و پانتاییەکەی لەدیمەنێك دەچو رازاوە بەگوڵ و گیا و سەوزەی بەهاری. گەڵاکان هەوریشمین بون بەلقە زێرینەکانەوە. گوڵەکانی زێڕین و زیوین بون و میوەکانی وەك گەوهەر. عەربەکان بە قتف ناویان دەبرد.

کاتێك پێنج یەکەکان گەیشتە لای عومەر، بەشی ئامادە بوان و ئامادە نەبوان و شەڕکەرە تێکۆشەرەکانی بەخشی دواتر پێنج یەکەکانی لەجێگەی پێویست دانا. دواتر وتی: سەبارەت بەم فەرشە گرانبایە رێنوێنیم بکەن. دەستەیەك وتیان: هەڵیگرە بۆ خۆت و دەستەیەك وتیان، هەرچۆن خۆت مەبەستتە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: خوا زانایی تۆی بۆ نەزانی و دڵنیایی تۆی بەگومان نەگۆڕیوە. لەم دنیا ئەوەت پێدەگات کەبەخشیوتە و فەرمانت بۆ داوە یا پۆشیوتە و کۆنت کردوە یا خواردوتە و لەناوت بردوە. ئەگەر ئەم بەهارستانە بەشێوەی ئەمڕۆی نەیهێڵیتەوە و پاشەکەوتی نەکەیت،

بەیانی ئەو کەسانە لەناو دەچن کەشتێك بکەنە هی خۆیان کەشیاو نین بۆی.

عومەر وتی: راستت کرد و باشەی منت ویست. عومەر، ئەو فەرشە گرانباییەی لەت لەت کرد و لەناو ئەواندا دابەشی کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەتێکی بەرکەوت کە بەبیست هەزار فرۆشتی لە کاتێکدا باشترین لەتی نەبو.

ئەوەی پێنج یەکەکانی بۆ مەدینە برد، بوشر کوڕی خەصایصیە بو. خەڵك شەڕکەرانی قادسیەیان وەسف کرد. عومەر وتی: ئەوانە گەورەکانی عەرەبن.

کاتێك عومەر شمشێرەکەی نەعمانی بینی، لەجوبەیر کوڕی موتعیم پرسیاری نەژادی نەعمانی کرد: جوبەیر وتی: عەرەبەکان ئەویان بۆ یەکێك لەلقەکانی (قنص) دەگەڕاندەوە. یەکێك لەبەنی عەجەم کوڕی قنص بو. خەڵك نەیانتوانی وشەی عەجەم بەجوانی بێننە سەر زمان و کردیان بەلەخم. عومەر شمشێری نەعمانی بە بەجوبەیر بەخشی.

عومەر کوڕی خەتاب، سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی بۆ پێشنوێژی لەپانتاییە دەست بەسەرداگیراوەکان و فەرماندەیی هێزە شەڕکەرەکانی دەست نیشان کرد و کاری باج و خەراجی بە نوعمان و سوەیەد کوڕی موقەردن سپارد: سوەیەدی لەسەر ئەستێلکەکانی فورات و نەعمانی لەسەر ئەستیلکەکانی دیجلە. دواتر ئەم دوانە لەو کارە خۆیان کێشایەوە و عومەر کارەکەی بە حوزەیفە کوڕی ئەسید و جابر کوڕی عەمرۆ مەزنی سپارد.

ماوەیەك دوای ئەوە کاری ئەوان بەحوزەیفە کوڕی یەمان و عوسمان کوڕی حەنیف گەیشت.

## شەڕی جەلەولا و دەست بەسەردا گرتنی حیلوان

### لەم ساڵەدا شەڕی جەلەولا رویدا.

هۆکارەکەی ئەوە بوکاتێك ئێرانیەکان دوای هەڵاتن لەمەداین، ڕۆشتنە جەلەولا، رێگای جۆراوجۆریان بەرەو لای خەڵکی ئازەربایجان و خەڵکی کوێستان (کوردستان) و فارس دۆزیەوە. ئێرانیەکان وتیان: ئەگەر بڵاو ببنەوە، هیچ کات کۆنابنەوە. ئێرە ئەو شوێنەیە ئێمە لەیەك جیا دەکاتەوە. با لەبەرابەر عەرەبەکان کۆببینەوە و شەڕیان لەگەڵدا بکەین. ئەگەر شەڕ لەبەرژوەندی ئێمەدا بێت، ئەوەیە کەدەمانەوێت و ئەگەر پێشهاتێکی دیکە رویدات، ئەوەی لەئەستۆی ئێمەدایە ئەنجاممان داوە و و بە کارو شەڕی کردنی خۆمان، داوای لێبوردنمان هێنابێتەوە. لەوێ سەنگەرێکی گەورە و قووڵ و درێژیان هەڵکەند و لەدەوری مێهران رازی کۆبونەوە. یەزدگێرد ڕۆشتە حیلوان وئەوانی لەدەوری سەنگەرەکانی خۆیان بەتەلی دڕکاوی بەهێز کرد و تەنیا رێگاکانیان هێشتەوە. هەواڵی ئەم کارەبە سەعد گەیشت و ئەو عومەر کوڕی خەتابی ئاگادار کردەوە. عومەر بۆی نوسی: هاشم کوڕی عوتبە بۆ جەلەولا رەوانە بکە و فەرماندەیی پێشەنگەکان بەقەعقاع کوڕی عەمرۆ بسپێرە. ئەگەر خوا ئێرانیەکانی شکەستدا، فەرماندەیی نێوان سواد و کوێستان (کوردستان) بەقەعقاع ببەخشە. دەبێت شەڕکەران دوانزە هەزار کەس بن.

سەعد ئەم کارەی کرد و هاشم دوای دابەش کردنی تالأنیەکان، هاورێ لەگەڵ دوانزە هەزار پیاوی شەڕکەر بەرێکەوت کەروخسارە دیارەکانی موهاجیرەکان و ئەنسار و گەورەکانی عەرەب لەناویاندا بون چ ئەوانەی لەدین هەڵگەڕابونەوە چ ئەوانەی لەدین هەڵنەگەڕابونەوە. ئەو لەمەداینەوە بەرێکەوت و لەبابلی مێهرود تێپەڕی. دێدارەکەی ئەوێ لەسەر ئەو بنەمایە پەیمانی ئاشتی بەست کەجەریبی زەوی بۆ ئەو بەدرەم فەرش بکات. ئەو رازی بو و پەیمانی ئاشتی بەست. دواتر بەرێکەوت تا گەیشتە جەلەولا و ئەوانی لەناو سەنگەرەکانیان گەمارۆدا و لەهەمو لاکانەوە دەوری گرتن. ئێرانیەکان بەزیانی موسوڵمانەکان کار و ماوەکەیان درێژ کردەوە و نەدەهاتنەدەر تەنیا ئەو

کاتانەی دەیانویست. موسوڵمان بۆ ماوەی هەشتا رۆژ شەڕ و بەزیانی ئەوان پێشڕەوی و پاشەکشێیان کرد و لەهەموی ئەم شەڕانەدا موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. هێزە پشتیوانەکان لەلایەن یەزدگێردەوە بۆ مێهران دەگەیشتن. سەعدیش بۆ موسوڵمانەکان هێزی پشتیوانی دەنارد. ئێرانیەکان کەزۆر ببون، هاتنەدەر و بۆ شەڕ ریزیان بەست. خواوەند تۆفانێکی هەڵکرد کەجیهانی لەبەر چاویاندا تاریك و تار کرد. سوپای ئێران رێگاکانیان لەیەك بەست و بەریەك کەوتن و سوارەکانیان کەوتنە ناو سەنگەرەکانەوە. لەوێ رێگاکیانیان بۆ خۆیان دروست کرد تا سوارەکانیان بتوانن بێنەدەر. قەڵاگانی خۆیان لەناو برد. هەواڵی ئەم کارە بەموسوڵمانان گەیشت و پێشڕەویان کرد و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد کەتەنانەت لە(شەوی زوزەیش) بەوشێوەیە شەڕیان نەکردبو جگە لەوەی ئەمەیان خێراتربو. قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەو شوێنەوەی کەپێشڕەوی کردبو، ڕۆشتە ناو سەنگەرەکان و گرتی و بەجارچیەکی فەرمو کەجاریدا: ئەی دەستەی موسوڵمانان، ئەوە فەرماندەکەی ئێودیە ڕۆشتۆتە ناو سەنگەرەکانی ئەوان و سەنگەرەکان بەهەوڵی ئەو دەستی بەسەردا گیراوە. بەرەو ئێرە بەرێکەون و ئەوانەی لەنێوان ئێوە و ئەودان، نابنە رێگر لەبەردەم هاتنی ئێوە بۆ سەنگەرەکان. ئەو فەرمانیدا بەم شێوەیە جار بدەن تا موسوڵمانان دلگەرم و بەهێز بن. موسوڵمانان هێرشیان برد و گومانیان نەبو هاشم لەناو سەنگەرەکاندایە. بینیان قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەناو سەنگەرەکاندایە و سەنگەرەکان بەهەوڵی ئەو گیراون. بتپەرستەکان شکەستیان خوارد و بەراست و چەپدا رایان کرد و لەناو ئەو تەلە دڕکاویانەی دایاننابو، گیریان کرد و لەناوچون. سوارەکانیان قوربانی کران و ئێرانیەکان پیادە مانەوە و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و جگە لەدەستەیەکی کەم رزگاریان نەبو. لەم رۆژەدا یەکسەد هەزار کەس لەئێرانیەکان کوژرا. ئەم شەڕەیان بەجەلەولا (پۆشێنەر) ناو برد چونکە هەمو جێگەیەکی بەکوژاروەکان داپۆشی. ئەمە داپۆشینی گۆڕەپانی شەڕ بو. قەعقاع کوڕی عەمرۆ تا خانەقین بەدوای ئەواندا ڕۆیشت.

کاتێك هەواڵی ئەم شکەستە بەیەزدگێرد گەیشت، لەحیلوانەوە بەرەو رەی بەرێکەوت. قەعقاع ڕۆیشتە حیلوان و لەگەڵ سوپایەکی کۆکراوە لەشەڕکەرە سورپێستەکان و هۆزە بەربلاوەکان (یا نەژادە نەناسراوەکان) لەوێ دابەزی. گرتنی جەلەولا لەمانگی زی

قەعدەی ئەم ساڵە /دێسامبەری ٦٣٧ زایینی رویدا. کاتێك یەزدگێرد لەحیلوانەوە بەرێکەوت، خەسرشنومی وەك جێگری خۆی لەوێ دەست نیشان کرد. کاتێك قەقعاع گەیشتە کۆشکی شیرین (قەصری شیرین)، خەسرشنوم روبەروی بویەوە و زەمینەبی دێداری حیلوان بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو ریزی بەست., خەسرشنوم هەڵات و موسوڵمانان بەسەر حیلواندا زاڵبون. قەعقاع لەوێ مایەوە تا سەعد بۆ کوفە گەڕایەوە و قەعقاع پەیوەستی بو و غوباد وەك جێگری خۆی لەحیلوان دەست نیشانی کرد کە لەنەژادی خوراسانیەکان بو.

هەواڵی ئەم سەرکەوتنەیان بۆ عومەر نوسی و وتیان کەقەعقاع لەحیلوان دابەزیوە. داوای فەرمانیان لێکرد تا بەدوای ئێرانیەکاندا برۆن. ئەو رازی نەبو و وتی: زۆرم حەز دەکرد لەنێوان سواد و کوێستان دیوارێکی بەهێز و ئەستور دەبو و نەئەوان رێگەیان بۆ هاتن بۆ لای ئێمە دەبو نە ئێمە بۆ لای ئەوان. لەپانتایی دێهاتەکان سواد بۆ ئێمە بەسە. من تەندروستی موسوڵمان بەلەپێشتر لەهەمو شتێك دەزانم تەنانەت لەدەستکەوتنی تالآنی و دەسکەوتەکانیش.

قەعقاع لەبەدواداچونی ئێرانیەکان گەیشتە خانەقین و لەوێ مێهرانی گرت و کوشتی. فیروزانی بینی کەڕۆیشت ولەقولآیی کوێستانەکاندا رۆچو و لەقەلآکاندا خۆی حەشاردا. قەعقاع دەستەیەکی بینی ونەسیری کردن ئەوانی بۆ لای هاشم نارد کەئەویش بەسەر موسوڵماناندا دابەشی کرد. موسوڵمانان ئەوانیان کردە هاوسەری خۆیان کەمناڵیان بۆ هێنایە دونیا. لەناو ئەم ژنانە دەتوانین ئاماژە بە(دایکی شەعبی) بدەین.

تالآنیەکانیان دابەش کرد و بەهەر سوارەیەك نۆهەزار (دینار، درەم) و نۆ چوارپێ یا مەڕومالآت گەیشت. دەستەیەك دەڵێن: هەمو تالآنیەکان گەیشتە سی هەزار هەزار (سی ملیون) کەسەلمان کوڕی رەبیعە ئەوانی دابەش کرد و سەعد پێنج یەکی بۆ لای عومەر نارد. ژومارەکەی بەزیاد کوڕی ئوبیە (زیادی بێ باوك) رەوانە کرد و ئەو لەبەردەم عومەر وتارێکدا وباسی ئەوەی کرد کەهێنابوی. عومەر وتی: ئایا دەتوانی لەبەرابەر خەڵك قسە بکەیت وئەوەی بەمنت وت، بۆ ئەوانی باس بکەیت؟ زیاد وتی: سوێند بەخوا لەسەراسەری زەوی کەس بەشکۆتر و بەرێزتر لەتۆ لای من نیە. چۆن نەتوانم ئەوەی بەتۆی دەڵێم، بەکەسانی دیکە بڵێم؟ زیاد لەبەرابەر خەڵك قسەی کرد ئاماژەی

دا بەوەی گرتویانە و کردویانە و ئەوەی دەیانەوێت دەستی پێبکەن و برۆنە قولایی زەویەکان. عومەر وتی: ئەمە وتاردەرێکی خرۆشان و قسەکەرێکی پاراوە. زیاد وتی: سوپاکەی ئێمە زمانی ئێمەیان کردۆتەوە.

کاتێك پێنج یەکیان بۆ لای عومەر برد، وتی: سوێند بەخوا هیچ سەقفی ماڵێك سێبەری لەسەر دروست ناکات تا دابەشی بکەم. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و عەبداللە کوڕی ئەرقەم لەمزگەوت پاسەوانیان کرد و شەویان کردە رۆژ. کاتێك بەرەبەیانی گەیشت، هاتە لای خەڵك و پەردەی لەسەر روخسار هەڵگرت. کاتێك سەیری یاقوت و گەوهەر و مرواریدەکەی کرد، گریا. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران تۆ بۆچی دەگریت؟ نێرە، سوێند بەخوا، شوێنی سوپاس کردنە. عومەر وتی: ئەمە ئەو شتە نیە من دەگریێنێت. خوا ئەم هەمو خواستە بەخەڵکێك نابەخشێت مەگەر ئەوەی رژدی بەیەك ببەن و ببنە دوژمنی یەکتر. رژدی بەیەك نابەن مەگەر ئەوەی خوا زیانی خۆیان لەناو خۆیاندا بلاو بکاتەوە. عومەر لەدابەش کردنی سواد پێشگیری کرد چونکە بەبونی دارستانەکان، جەنگەڵەکان، ئەستیلکەکان، و زۆنکاوەکان و گۆلاوەکان، ئەم کارە نەگەری نەبو. جیاواز لەمانە، ئاتەشکەدەکان لەئارادابون و رێگاکانی کاروان، زەوی و سامانی خوسرەوەکان و بنەماڵەکانی ئەوان، سامانی کوژراوەکان کەپاشماوەکانیان خوازیاری تۆڵە سەندنەوە بون، هۆزە نیشتەجێبوەکانی سەر زەوی، ئاشەکان و شتەکانی هاوشێوە. لەبەر ئەمە دابەشی نەکرد و فرۆشتنی بەناڕەوا لەقەڵەمدا چونکە بەش نەکرابو. ئەوانیان کردە وەقف بەوشێوەی کەسەرپەرەستیەکەی بەکەسێك بسپێرن کە لەهەڵبژاردنیدا هاورابن. ئەوان تەنیا بۆ فەرماندەکان هاورا دەبون. لەسەر ئەم بنەمایە، فرۆشتنی هیچ شتێك لەزەمینەکانی سواد لەنێوان حیلوان و قادسیە رەوا نیە. جەریر لەکەناری فورات زەویەکی کڕی بەلام عومەر ئەم مامڵەی پێ ناخۆش بو و هەڵیوەشاندەوە.

## گرتنی تكريت و موسل

لەم ساڵەدا لەمانگی جەمادی /ژوئەنی – ژوئیەی ٦٣٧ زایینی تكريت دەستی بەسەردا گیرا.

هۆكاری ئەم شەڕە ئەوە بو (ئەنتاق) لەموسڵەوە رەوانەی تكريت بو و لەدەوروبەری خۆی سەنگەرێكی سەراسەری هەڵكەند تا سەرزەمینەكانی خۆی بپارێزێت. رۆمیەكان لەگەڵ ئەودا بون و ئەیادیەكان و تەغلەبیەكان و نەمریەكان و شەهرجیانیش بەهەمان شێوە. هەواڵی ئەم كارە بەسەعد گەیشت و ئەو عومەری ئاگادار كردەوە كەبۆی نوسی: عەبداللە كوڕی موعتەم بەفەرماندەیی دەستەیەكی شەڕكەر رەوانە بكە و فەرماندەی پێشەنگەكان بەرەبعی كوڕی ئەفكەل ببەخشە و دەستی سوارەكان بەعەرفجە كوڕی هەرسمە. عەبداللە بەرەو تكريت رەوانە بو و لای ئەنتاق دابەزی و بۆ ماوەی چل رۆژ گەمارۆی ئەوانیدا. هەردولا بۆ ماوەی بیست و چوار جار بەرەو لای یەك پێشڕەویان كرد و روبەروی یەك بونەوە. ئەم سوپایە لەشەڕكەرانی جەلەولا شكۆ و بەهێزی كەمتری بو. عەبداللە كوڕی موعتەم پەیامی بۆ ئەو عەرەبانە نارد كەلەگەڵ ئەنتاقدا بون و داوای هاوكاری لێكردن. ئەوان هیچیان لەو نەدەشاردەوە. كاتێك رۆمیەكان بینیان موسوڵمانەكان لەپێشترن، فەرماندەكانی خۆیان بەجێهێشت و كالاكانی خۆیان بۆ ناو كەشتیەكان برد. نەمریەكان و تەغلەبیەكان و ئەیادیەكان پەیامیان بۆ عەبداللە نارد و ئەویان لەم كارە ئاگادار كردەوە و داوای ئەمانیان كرد و پێیان وت كەهاوكاری دەكەن. ئەو پەیامی بۆ ناردن ئەگەر راست دەكەن باوەڕ بەئیسلام بێنن. ئەوان رازی بون و باوەڕیان هێنا. عەبداللە كەسی بۆ لای ئەوان نارد كە: كاتێك دەنگی تەكبیری ئێمەتان بیست بزانن كەدەروازەكانی سەنگەرەكانمان گرتوە. ئێوە ئەو درگایانەی بەرەو دیجلە دەكرێنەوە، بگرن و تەكبیر بڵێن و هەر كەسێكتان توانی بیكوژن.

عەبداللە و موسوڵمانان لەشوێنی خۆیان نەجوڵان و تەكبیریان وت و خەڵكی تەغلەب و ئەیاد و نەمریش تەكبیریان وت و درگاكانیان گرت. رۆمیەكان گومانیان برد كەموسوڵمانەكان لەپشتی دیجلەوە هێرشیان كردۆتە سەریان. لەبەر ئەمە ئاهەنگی ئەو درگایانەیان كرد كەموسوڵمانەكان پارێزگاریان لێدەكرد. شمشێری موسوڵمانەكان و

شمشێری ئەو رەبیعیانەی لەو شەوەدا باوەڕیان هێنابو، کەوتنە ناو ئەوان.
لەکەسانی ناو سەنگەر کەس رزگاری نەبو مەگەر ئەو کەسانەی لەتەغلەب و نەمر و ئەیاد کەباوەڕیان هێنابو. عەبدالله کوڕی موعتەم، رەبعی کوڕی ئەفکەلی بەرەو ئەو دوقەلایە نارد کە بەموسل و نەینەوا ناو دەبران. نەینەوایان بەقەلای رۆژهەلات ناودەبرد و موسلیان بەقەلای رۆژئاوا. پێی وت: پێش راپۆرتەکە بکەوە ( پێش ئەوەی راپۆرت بگات خۆت بگەیێنە). تەغلەبیەکان و ئەیادیەکان و نەمریەکانی کردە هاورێی ئەو. ئەوان پێش راپۆرتەکە کەوتن و سەرکەوتنیان ئاشکرا کرد و تالانیەکانیان نیشاندا و مژدەیان پێدان و لەسەر دەروازەکان بۆ پاسەوانی کردن جێگیر بون. کوڕی ئەفکەل بەرەو دوقەلاکە پێشڕەوی دەست پێکرد. ئەوان هەر دو قەلاکەیان بەست. خەلکانی ناو قەلا هاواریانە کرد بەئاشتی رازی دەبن لەسەر ئەو بنەمایە کە، موسولمانەکان ئەمانیان پێبدەن. تالانیەکانیان دابەش کرد. بۆ هەر سوارێك سێ هەزار درەم وبۆ هەر پیادەیەك هەزار درەم. پێنج یەکیان بۆ عومەر نارد. فەرماندەیی شەڕی موسل لەدەستی رەبعی کوڕی ئەفکەل دابو و سەرپەرەستی باج و خەراج بەدەستی عەرفەجە کوڕی هەرسمە.
دەستەیەك دەلێن: عومەر کوڕی خەتاب، عوتەیبە کوڕی فەرقەدی بەفەرماندەیی شەڕی موسل دەستنیشان کرد کە لەسالی بیستەم/٦٤١ زایینی دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. ئەو رۆشتە ئەو ناوچەیە و خەلکی نەینەوا شەڕیان لەگەل کرد. قەلاکەی کەقەلای رۆژهەلات بو، بەزۆری شمشێری دەستی بەسەردا گرت. لەدیجلە تێپەڕی و خەلکی قەلای رۆژئاوا یانی موسل بەئاشتی پێشوازیان لێکرد لەسەر ئەو بنەمایە کەباج بدەن و موسولمانەکان ئەمانیان پێببەخشن. دواتر دەستیان بەسەر ئەم شارانەدا گرت: مەرج، بانهدرا، باعزرا، حێبتون، داسن، هەمو قەلاکانی کوردان، قەروی، بازبدی، و هەمو پانتاییەکانی موسل. هەموی ئەمانە بونە مولکی موسولمانەکان.
دەستەیەك دەلێن: کاتێك عەیاز کوڕی غەنەم دەستی بەسەر (بەلەد) دا گرت( کەئامازەی پێدەدەین) هاتە موسل و یەکێك لەم دو قەلایەی گرت و عەتەبە کوڕی فەرقەدی بۆ قەلاکەی دیکە رەوانە کرد کەلەسەر بنەمای دانی باج دەستی بەسەرداگیرا. و خوا زاناترە.

## دەست بەسەرداگرتنی ماسەبەزان

کاتێك هاشم لەجەلەولا بۆ مەداین گەڕایەوە، هەواڵ بەسەعد گەیشت کەنازین کوڕی هورموزان سوپایەکی کۆکردۆتەوە ئەوانی بردۆتە دەشت. ئەو زەرار کوڕی خەتابی لەگەڵ سوپایەك رەوانە کرد کە لەدەشتی ماسەبەزان روبەروی هێزەکانی ئازین بونەوە و شەڕیان لەگەڵ کردن. موسوڵمانان بەپەلە، کاری بتپەرستەکانیان تەواو کرد. زەرار ئازینی بەئەسیری گرت و لەملیدا. دواتر دەستی بەگەڕان کرد تا گەیشتە سیروان و ماسەبەزانی بەزۆر گرت و خەڵکەکەی بۆ کوێستانەکان رایان کرد. ئەوانی بانگ کرد کەوەڵامیان دایەوە و بەداواکەی رازی بون. لەوێ مایەوە تا سەعد رۆشتە کوفە و کەسی بەشوێندا نارد کەگەڕایەوە و لەکوفە نیشتەجێ بو. کوڕی هوزەیلی ئەسەدی کردە فەرمانڕەوایی ماسەبەزان. ماسەبەزان بوبەیەکێك لەدەروازەکانی کوفە.
دەستەیەك دەڵێن: گرتنی دوای شەڕی نەهاوەند بو.

## دەست بەسەردا گرتنی قرقیسیا

کاتێك هاشم لەجەلەولا بۆ مداین گەڕایەوە و دەستەکانی خەڵکانی جەزیرە کۆبونەوە و هاوکاری هراکلیویسیان لەبەرابەر خەڵکی حمص کرد و سوپایەکیان بەرەو خەڵکی هیت رەوانە کرد، سەعد عومەر کوڕی مالك کوڕی عوتبە کوڕی نەوفل کوڕی عەبدمەناف لەگەڵ سوپایەك رەوانە کرد و حارس کوڕی یەزیدی عامری کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی. عومەر کوڕی مالك لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو هیت رۆیشت و لەگەڵ خەڵکانی ئەوێ کەلەدەوری خۆیان سەنگەرێکی سەراسەریان هەڵکەندبو، شەڕی کرد. کاتێك عومەر کوڕی مالك بینی ئەوان بەسەنگەرەکانی خۆیان پشتگەرم و تیایدا جێگیرن، خێوەتی سوپاییەکانی بەجێهێشت و حارس کوڕی یەزیدی کردە جێگری خۆی و بازنەی گەمارۆدانی لەسەر ئەوان تەنگتر کرد. عومەر کوڕی مالك لەگەڵ نیوەی خەڵکان رۆیشتەدەر و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر قرقیسیا و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت کەخەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی باج تەسلیمی بون. بۆ حارس کوڕی یەزیدی نوسی: ئەگەر بەفەرمانەکەی تۆ رازی بون، رێگەیان بۆ بکەرەوە تا بێنەدەر و

گەرنە لەدەوری سەنگەرەکانی ئەوان سەنگەرێك بەدەروازەی پێویست لەلایەن سوپاکەی خۆت هەڵکەنە تا بزانم دەبێت چ کارێك ئەنجام بدەم. حارس پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد و ئەوان لەسەر بنەمای گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان بەپێشنیارەکانی رازی بون. ئەو رێگەی ئەوانی کردەوە و حارس بۆ لای عومەر کوڕی مالك گەڕایەوە.

## روداوەکانیتری ئەم ساڵە

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب ئەبو میحجەنی سەقەفی بەرەو ناصع رەوانە کرد.
هەروەها لەم ساڵەدا کوڕی عومەر لەگەڵ سەفیە کچی ئەبوعوبەیدە و خوشکی موختار پەیوەندی هاوسەریەتی بەست.
لەم ساڵەدا رەبەزەی بۆ ئەسپی موسوڵمانان نۆژەن کردەوە.
هەروەها لەم ساڵەدا ماریە دایکی ئیبراهیم کوڕی پێغەمبەر(ص) کۆچی دوایی کرد.
عومەر نوێژی لەسەر خوێند و ئەوی لەمانگی موحەڕەم/فەوریەی ٦٣٧ زایینی لەبەقیع بەخاك سپارد.
هەروەها لەم ساڵەدا عومەر بەراوێژ کردن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بناغەی مێژووی موسوڵمانانی دیاری کرد.
لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب حەجی لەگەڵ خەڵك کرد و زەید کوڕی سابتی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەست نیشان کرد. فەرمانداڕانی ئەو لەشارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشتر بون. فەرماندەیی شەڕی موسڵ لەدەستی رەبعی کوڕی ئەفکەلدا بو و سەرپەرەستی باج و خەراج لەدەستی عەرفەجە کوڕی هەرسمە. دەستەیەك دەڵێن: کاری شەڕ و باج هەردوك لەدەستی عەتبە کوڕی فەرقەد دابو. دەستەیەك دەڵێن: لەدەستی عەبدالله کوڕی موعتەم و فەرمانڕەوایی جەزیرە لەدەستی عەیاز کوڕی غەنەم؟

## روداوەکانی ساڵی حەفدەی کۆچی (٦٣٨ زایینی)

### بناغەدانانی کوفە

لەم ساڵەدا شاری کوفە بناغەی بۆ دارێژرا و سەعد لەمەداینەوە بۆ ئەو شارە کۆچی کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کەسەعد دەستەیەکی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای عومەر رەوانە کرد و هەواڵی سەرکەوتنەکانی رابردوی پێراگەیاند. کاتێك عومەر ئەوانی بینی، پرسی بۆ رەنگ و روخساریان گۆڕاوە. وتیان: خراپی ئاو و هەوای ئەم سەرزەمینە ئێمەی گۆڕیوە. عومەر فەرمانیدا سەرزەمینێك بدۆزنەوە و شارێکی تیا دروست بکەن تا خەڵك لەوێ نیشتەجێ ببن. هاورێ لەگەڵ ئەم وەفدە، چەند کەسێك لەبەنی تەغلەب هاتبون تا سەبارەت بەخەڵکەکەی خۆیان لەگەڵ عومەر پەیمانێك ببەستن و هاوڕابن. عومەر وتی: تەنیا لەسەر ئەو بنەمایە پەیمان دەبەستم کەهەر کەس لەئێوە باوەڕ بەئیسلام بێنێت، ئەوەی پێدەبڕێت کەبەموسوڵمانەکانی دیکە و هەر کەس خۆی بەدور بگرێت و باوەڕ نەهێنێت دەبێت باج بدات. وتیان: بەمشێوەیە ئەوان هەڵدێن و دەبنە ئێرانی. پێشنیاری پێدانی داراییان پێکرد بەڵام عومەر رازی نەبو. ئەوان باجی خۆیان کردە هاوتای زەکاتی موسوڵمانان. عومەر رازی بو لەسەر ئەو بنەمایەی کەهیچ منداڵێك نەکەنە مەسیحی. ئەم تەغلەبیانە و شوێنکەوتوانیان لەنەمر و ئەیاد رۆشتنە مەداین بۆ لای سەعد و لەم شارە دابەزین و دوای ئەوە لەگەڵ ئەو بۆ کوفە کوچیان کرد.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو حوزەیفە بۆ عومەری نوسی: سکی عەرەبەکان بەپشتیانەوە نوساوە. بازویان وشك و رەنگیان گۆڕاوە. ئەو هاورێی سەعد بو. عومەر بۆ سەعدی نوسی: ئاگادارم بکەرەوە بۆ گۆشت و پێست و رەنگی عەرەبەکان گۆڕاوە. سەعدی بۆی نوسی: ئەوەی ئەوانی گۆڕیوە، خراپی ئاو و هەوای ئەم ناوچەیە. تەنیا شوێنێك لەگەڵ سرشتی عەرەبەکان سازگارە کەبۆ وشترەکان سازگار بێت. عومەر بۆی نوسی: سەلمان و حوزەیفە وەك دو پێشەنگ رەوانە بکە تا سەرزەمینێك بۆ بناغە دانانی

شارێکی وشکانی- دەریایی بدۆزنەوە بەشێوەیەك لەنێوان من و ئێوە هیچ پرد و دەریایەك نەبێت. سەعد ئەو دوانەی رەوانە کرد. سەلمان ڕۆیشت تا خۆی گەیاندە ئەنبار. لەرۆژئاوای فوراتەوە ڕۆیشت بەلام هیچ زەویەکی پەسەند نەکرد تا گەیشتە کوفە. هەر شوێنێك لم و زیخی زۆر بێت، پێی دەڵێن کوفە. ئەم دوانە بەدەوری ئەو سەرزەمینە سوڕانەوە و لەوێ سێ دەیریان بینی: دەیری حورمەت، دەیری دایکی عەمرۆ و دەیری سیلسیلە. لەم لاولاکەی دارستان و قامیشەلان بو. ئەم دوانە دابەزین چونکە ئەو سەرزەمینەیان پەسەند کرد. نوێژیان خوێند و لەخوا پاڕانەوە ئەوێ بکاتە شوێنێکی ئارام و بەهێز بۆ موسوڵمانان. کاتێك ئەم دوانە بەم هەواڵە بۆ لای سەعد گەڕانەوە و نامەی عومەریش گەیشت، سەعد بۆ قەعقاع کوڕی عەمرۆ و عەبداللە کوڕی موعتەمی نوسی کەجێگرەکانی خۆیان بکەنە فەرماندەی سوپاکەیان و بڕۆنە لای. سەعد لەمەداینەوە کۆچی کرد و لەموحەڕەمی ساڵی ١٧/فەوریەی ٦٣٨ زایینی لەکوفە دابەزی. لەنێوان ڕۆشتنی بۆ کوفە و شەڕی قادسیە دومانگ بو. ماوەی نێوان فەرمانڕەوایی عومەر و بناغەدانانی کوفە سێ ساڵ و هەشت مانگ بو. کاتێك سەعد لەوێ دابەزی، بۆ عومەری نوسی: من لەکوفە دابەزیم و کردم بەشوێنی نیشتەجێ بونی خۆم. شوێنێکە لەنێوان فورات و حیرە، وشکانی – دەریایی کە تیایدا (حەلفا و نەصی) دەڕوێت. موسوڵمانانم لەنێوان هەڵبژاردنی ئەم شارە و مەداین سەرپشك کرد و هەرکەس بیەوێت لەمەداین بمێنێتەوە، وەك پاسەوانی سنور لەوێ نیشتەجێی دەکەم. کاتێك لێرە ئارامیان گرت، خۆیان ناسیەوە و هێز لەدەست چوەکانیان بەدەست هێنایەوە. خەڵکی کوفە فەرمانیان وەرگرت تا ماڵەکانیان لەقامیش دروست بکەن. هەروەها خەڵکانی بەسرەیش بۆ ئەم کارە فەرمانیان وەرگرت. خەڵکی بەسرە لەهەمان شوێن نیشتەجێ بون کەخەڵکی کوفە. ئەمە دوای سێ جار دابەزینی کۆچکەران بو لەسەرزەمینی کوفە.

بۆ ئەوانی نوسی: سوپاییەکان نیازمەندی شەڕکەری ئێوەن بەلام من حەز ناکەم لەگەڵ ئێوەدا ناسازگار بم.

خەڵکی هەر دوشارەکە ماڵەکانیان بەقامیش دروست کرد. لەمانگی شەوال / ئۆکتۆبەری ٦٣٨ زایینی لەکوفە و بەسرە روداوی ئاگر کەوتنەوە رویدا و ئاگر کەوتنەوە لەکوفە

دژوارتر و مەترسیدارتر بو. سەعد چەند کەسێکی بۆ لای عومەر نارد و داوای فەرمانێکی لێکرد تا خەڵك ماڵەکانی خۆیان بەخشت دروست بکەن. ئەوان گەیشتنە لای عومەر و لەرودانی ئاگرکەوتنەوەکە ئاگاداریان کردەوە و داوای فەرمانیان لێکرد. وتی: ئەو کارە بکەن بەڵام کەس لەئێوە زیاتر لەسێ ژور دروست نەکات. بیناکانتان شکۆدار دروست مەکەن و شێوازی رازاندنەوەی پێغەمبەر(ص) لەبیرمەکەن تا دەوڵەت و شکۆی ئێوە هەمیشەیی بێت. ئەوان بەم پەیامە بۆ کوفە گەڕانەوە. عومەر هاوشێوەی ئەم پەیامەیشی بۆ خەڵکی بەسرە نوسی.

سەرپەرەستی نیشتەجێ کردنی خەڵك لەکوفە ئەبو هەیاج کوڕی مالك و سەرپەرەستی نیشتەجێ کردنی خەڵك لەبەسرە ئەبو جەربێ عاصم کوڕی دۆلف بو. شەقامەکانیان بەچل گەز بەراوەردە کرد، ناوەڕاستەکەی بەبیست گەز و کۆڵانەکان حەوت گەز و شارێکان شەست گەز. یەکەم بیناکان کەبناغەیان بۆ دانا و دروستیان کرد، مزگەوتەکانی ئەم دوشارە بو. لەنێوان هەر دو مزگەوتەکە پیاوێکی بەهێز وەستا و لەهەر لایەك تیرێکی هاویشت و فەرماندرا، دورتر لەتیرەکان بیناکان دروست بکەن. لەدەرگای مەزگەوت لەسەر دو ستون، لەخشتی بیناکانی خوسرەو لەحیرە، سایەوانێکیان دروست کرد. بەدەوری صەحنەکە سەنگەرێکیان هەڵکەند تا کەس نەتوانێت لەرێگەی بیناکانەوە، هێرش بکاتە ناوەوە. لەبەرابەر ئەوێ بۆ سەعد ماڵێکیان دروست کرد کەئەمڕۆ کۆشکی کوفەیە. ئەو بینایە لەسەردەستی روزبە لەخشتی بیناکانی خوسرەو لەحیرە بناغەی بۆ دانا و دروستی کرد. بازارەکانیان هاوشێوەی مزگەوتەکان دروست کرد. هەرکەس زوتر لەکەسانیتر دەڕۆشتە ناو ماڵ یا سەرزەمینێك، دەبو بەهی خۆی، تا لەوێوە بۆ ماڵەکەی خۆی بڕوات یا بیفرۆشێت. ئەم هەواڵە بەعومەر گەیشت کەکاتێك سەعد دەنگە دەنگ و قەرەباڵغی بازارەکانی بیست، هاواری کردکە: زیانی ئەم دەنگە دەنگە لەمن دور بکەنەوە! وتیان خەڵك ماڵەکەی ئەو بەکۆشکی سەعد ناو دەبەن. ئەو محەممەدی موسلیمەی رەوانەی کوفە کرد و فەرمانی پێدا بەتوندی لەدەرگای کۆشك بدات و بگەڕێتەوە. ئەو ئەم کارەی کرد. سەعد بیستی و محەممەد وتی: نێردراوێکە کەبۆ ئەم کارەیان ناردوە. سەعد ئەوەی بۆ ناوەوە بانگ کرد بەڵام محەممەد نەڕۆیشت و ئامادەیی نیشان نەدا بڕواتە ناو. سەعد هاتەدەر و دیاریەکی پێشکەش کرد بەڵام

محەممەد ئەیگرت و نامەکەی عومەری بەمشێوەیەی بەو گەیاند: بیستومە کەتۆ کۆشکێکت دروست کردوە و کردوتە بەقەڵای خۆت. خەڵك بەکۆشکی سەعد ناوی دەبەن. لەنێوان تۆ و خەڵکان دەرگایەکە کەبێ فەرمان ناتوانن بەتۆ بگەن. ئەمە کۆشکی تۆ نیە، کۆشکی لەناوچون و فیرۆیی و شێتیە. لەوێ وەرەدەر و لەو لای گەنجخانەکان ماڵێك بۆ خۆت هەڵبژێرە و دەرگای کۆشکەکە ببەستە و گەرنە کەسێك لەبەر دەرگای کۆشك دادەنێین تا لەهاتوچۆ بۆ ناو کۆشکەکە رێگری بکات. سەعد سوێندی خوارد کە ئەو قسانەی نەکردوە و ئەو کارانەی ئەنجام نەداوە. محەممەد گەڕایەوە و پەیامەکەی سەعدی بەعومەر راگەیاند و عومەر قسەکانی بەراست زانی.

سنورەکانی کوفە چوار دانە بون: حیلوان کەقەعقاع لەوێ جێگیر کرابو، ماسەبەزان کەزەرار کوڕی خەتاب فەرماندەییەکی لەئەستۆدابو، قرقیسا کەعەمرۆ کوڕی مالك یا عەمرۆ کوڕی عوتەبە کوڕی ئەوفل سەرپەرەستی دەکرد و موسڵ کەعەبدالله کوڕی موعتەمیان لەوێ دانابو. جێگرەکانی ئەوان لەم شوێنانە بون کەئەگەر ویستیان بۆ شوێنێك بڕۆن، کاروبارەکان رابپەڕێنن. سەعد دوای بناغەدانانی کوفە، بۆ ماوەی سێ ساڵ و نیو فەرمانداری ئەو شارە بو و ئەمە جیاواز لەفەرمانڕەوایی ئەو لەمەداین بو.

گێرانەوەی بارودۆخی حمص لەکاتی هێرشی هراکلیوس بۆ سەر موسوڵمانەکانی ئەوێ لەم ساڵەدا رۆمیەکان ئاهەنگی ئەبوعوبەیدە کوڕی جەراح و موسوڵمانانی هاورێی ئەویان لەحمص کرد. بزوێنەری رۆمیەکان، خەڵکانی جەزیرە بون چونکە ئەوان پەیك و پەیامیان بۆ پاشاکانی رۆم نارد و ناچاریان کرد سوپایەك بۆ شام رەوانە بکات. مژدەیان پێدا کەخۆیان هاوکاریان دەکەن. ئەو ئەم کارەی کرد و سوپایەکی رەوانە کرد. کاتێك موسوڵمانان لەکۆبونەوەی ئەوان ئاگادار بونەوە، ئەبوعوبەیدە پادگانە سنوریەکانی ئەوانی پەیوەستی خۆی کرد و لەدەرەوەی شاری حمص نورودوی لێدا. خالید لەقێنسرینەوە پەیوەستی ئەوان بو. ئەبوعوبەیدە لەگەڵ هاورێکانی خۆی راوێژی کرد کە شەڕ دەست پێبکات یا تا گەشتنی هێزی پیشتیوانی لەناو قەڵاکاندا بمێنێتەوە. خالید بۆچونی وابو شەڕ دەست پێبکات وکەسانی دیکە پێیان باش بو لەناو قەڵاکاندا بمێنێتەوە. ئەبوعوبەیدە گوێی لەبۆچونی ئەوان گرت و نامەی بۆ عومەر نوسی. عومەر لە هەرشارێك بەئەندازی پێویست لەزیادە سامانی موسوڵمانەکان ئەسپەکانی

دانابو تا ئەگەر روداوێکی لەناکاو پێشهات، بتوانێت کەڵکیان لێوەربگرێت. تەنیا لەکوفە چوار هەزار ئەسپی لێبو کەسەرپەرەستی ئەوان لەدەستی سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی و چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە بو. لەهەر کام لەهەشت شارەکە بەو ئەندازەیە ئەسپەکانیان دانابو. ئەگەرپێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو رویبدایە، خەڵکان سواری دەبون و هێرشیان دەبرد تا سوپاییە شەڕکەرە بەئەزمونەکان ئامادەی شەڕ بن و بەرێکەون.

کاتێك عومەر ئەم هەواڵەی بیست، بۆ سەعدی نوسی: خەڵك کۆبکەرەوە و هەر ئەمڕۆ لەگەڵ قەعقاع کوڕی عەمرۆ رەوانەیان بکە چونکە مەترسی و زیان گەمارۆی ئەبوعوبەیدەیان داوە. هەروەها بۆی نوسی: سوهەیل کوڕی عودەی رەوانەی رەقە بکە چونکە خەڵکانی جەزیرە بون رۆمیەکانیان بۆ سەر حەمصیەکان هاندا. فەرمانی پێدا کەعەبدالله کوڕی عەتبان رەوانەی نەصیبین بکات و لەوێوە بەرەو حەڕان و ڕەها ، وەلید کوڕی عەقەبە بکاتە فەرمانەدەی عەرەبەکانی جەزیرە لەتەنوخ و رەبیعە و عەیاز کوڕی غەنەمیش رەوانە بکات. ئەگەر شەڕ روبدات، فەرماندەیی لەدەستی عەیازدا بێت.

قەعقاع هەمان رۆژ لەگەڵ چل هەزار پیاوی شەڕکەر بەرەو حمص بەرێکەوت. عەیاز کوڕی غەنەم و فەرماندارانی جەزیرەیش هاتنەدەر و رێگەی جەزیرەیان گرتەبەر و هەر فەرماندەیەك روی لەشارێك کرد کەفەرمانڕەوایەتی دەکرد. عومەر لەمەدینە هاتەدەر و بەمەبەستی هاوکاری کردنی ئەبوعوبەیدە لەحمص لەجابیە دابەزی.

کاتێك خەڵکانی جەزیرە کەرۆمیەکانیان دژی حمص هاندابو و لەگەڵ ئەوان بون، ئاگاداری هەواڵەکانی سوپای ئیسلام بونەوە، لەرۆمیەکان جیابونەوە و لەسەرزەمینەکانی خۆیان بلاوبونەوە. کاتێك ئەوان بلاوەیان لێکرد، ئەبوعوبەیدە لەگەڵ خالید راوێژی کرد کەهێرش بکاتە سەر رۆمیەکان یا نەیکات. خالید بۆچونی وابو بڕوات و شەڕ دەست پێبکات. ئەو ڕۆشتەدەر و روبەرویان بویەوە و خوا سەرکەوتنی پێ بەخشی. قەعقاع کوڕی عەمرۆ سێ رۆژ دوای شەڕەکە گەیشت. هەواڵی سەرکەوتنی خۆی و گەیشتنی هێزە یارمەتیدەرەکانی بۆ عومەر نوسی و داوای فەرمانیان لێکرد. بۆ ئەوانی نوسی: ئەوان لەبەش کردنی تالانیەکان بکەنە شەریك چونکە بۆ هاوکاری کردنی ئێوە هاتون و دوژمنانی ئێوە ئاهەنگی ئەوانیشیان کرد. دوبارە وتی: خوا باشترین پاداشت بەخەڵکی کوفە بدات کەسەرزەمینەکەی خۆیان دەپارێزن و هاوکاری خەڵکانی سەرزەمینەکانی

دیکەیش دەکەن.

کاتێك لەم شەڕە تەواو بون، بۆ ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە.

## دەست بەسەرداگرتنی جەزیرە و گرتنی ئەرمەنستان

## لەم ساڵەدا جەزیرە دەستی بەسەرداگیرا.

پێشتر ئاماژەمان پێدا سەعد سوپایەکی رەوانەی جەزیرە کرد. دواتر عەیاز کوڕی غەنەم و هاوڕێکانی ئەو هاتنەدەر و عەیاز سوهەیل کوڕی عودەی رەوانەی رەقە کرد. خەڵکی جەزیرە لەدەوروبەری حمص بڵاوەیان کردبو و رویان لەشارەکانی خۆیان کرد چونکە بیستبویان خەڵکی کوفە ئاهەنگی ئەوانیان کردوە. ئەو لەنزیك ئەوان دابەزی و مایەوە و گەمارۆیدان تا پێشنیاری ئاشتیان پێدا. پێشنیارەکەیان بردە لای عەیاز و ئەو لەشوێنێك لەناو جەزیرە بو. بەپێشنیارەکەی ئەوان رازی و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و ئەمانیان پێبەخشرا. عەبدالله کوڕی عەتبان لەموسڵ رۆشتەدەر و بەرەو نەصیبین بەرێکەوت. بەئاشتی پێشوازیان لێکرد هاوشێوەی خەڵکانی رەقە. ئەم هەواڵەیان بۆ عەیاز نوسی و رازی بو و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. وەلید کوڕی عەقەبە رۆیشتەدەر و لای عەرەبەکانی دەوروبەری جەزیرە دابەزی. موسوڵمان و ناموسوڵمان لەگەڵ ئەو هاتنەدەر مەگەر خەڵکانی ئەیاد کوڕی نزار کەرۆشتنە ناو سەرزەمینی رۆم. وەلید ئەم هەواڵەی بۆ عومەر نوسی.

کاتێك لەنەصیبین و رقە تەواو بون و ئەم دو ناوچەیان گرت، عەیاز، عەبدالله و سوهەیلی کردە هاوڕێی خۆی و خەڵکانی بۆ حەڕان برد. کاتێك گەیشتە ئەوێ، خەڵك لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتیان پێشنیار کرد و ئەو رازی بو. دواتر عەیاز، عەبدالله و سوهەیلی رەوانەی رەها کرد و خەڵکی ئەوێ لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتیان بەست و هەموی ئەوەی بەزۆر لەجەزیرەیان گرتبو، حسێبیان کرد. جەزیرە، بەم پێیە، لەهەمو شوێنیەکان ئاسانتر دەستی بەسەردگیرا. سوهەیل و عەبدالله بۆ کوفە گەڕانەوە. ئەبوعوبەیدە دوای گەڕانەوەی عومەر لەجابیە، بۆی نوسی کەئەگەر دەیەوێت خالید بۆ لای خۆی لەمەداین بانگێشت بکات، عەیاز بکاتە هاوڕێی ئەو. عومەر

عەیازی رەوانەی لای ئەبوعوبەیدە کرد. ئەو حەبیب کوڕی موسلیمەی کردە فەرمانڕەوایی ئێرانیەکانی جەزیرە و وەلید کوڕی عەقەبەی کردە فەرمانڕەوایی عەرەبەکان.

کاتێك نامەی وەلید بەعومەر گەیشت و هەواڵی دا کەدەستەیەك لەعەرەبەکان ڕۆشتونەتە ناو سەرزەمینی رۆمەکان، عومەر بۆ پاشای رۆمی نوسی: بیستومە چەندین هۆز لەهۆزەکانی عەرەبی سەرزەمینی ئێمەیان بەجێهێشتوە و رویان لەسەرزەمینی تۆ کردوە. سوێند بەخوا یا بێ چەند و چون ئەوان بۆ ئێمە دەگەڕێنیتەوە یا دەست بەجێ مەسیحیەکان لێرە دەردەکەین. پاشای رۆم ئەوانی گەڕاندەوە. لەناو ئەوان چوارهەزار کەس گەڕانەوە و پاشماوەکانیان لەو بەشانە لەشام و جەزیرە کەنزیك لەرۆمیەکان بو، بلاّو بونەوە. هەرچی ئەیادی لەسەرزەمینی عەرەبە، لەو چوار هەزار کەسەیە. لەم ناوەدا وەلید کوڕی عەقەبە بڕیارێدا لەتەغلەبیەکان تەنیا بەباوەڕهێنان بەئیسلام خۆش ببێت. ئەو سەبارەت بەوان نامەی بۆ عومەر نوسی. عومەر بۆی نوسی: ئەم کارە سەبارەت بەجەزیرەی عەرەب راستە کەخەڵکەکەی تەنیا بەباوەڕ هێنان وازیان لێ بهێنرێت. بەلاّم تۆ دەستبەرداری تەغلەبیەکان ببە بەو مەرجەی هیچ منالێك نەکەن بەمەسیحی و رێگر نەبن لەباوەڕ هێنانی هیچ کام لەخەڵکانی خۆیان. تەغلەبیەکان خەڵکانێکی بەشکۆ و بەهێز بون. وەلید ئاهەنگی ئەوانی کرد و عومەر ترسا بەسەختی ئەوان سەرکوت بکات و لەسەخت گرتندا سنورەکان ببەزێنێت. لەبەر ئەمە ئەوی لەسەر کار لابرد و فورات کوڕی حەیان و هند کوڕی عەمرۆ جەبەلی کردە فەرماندەی ئەوان.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گرتنی جەزیرە لەساڵی ٦٤٠/١٩ زایینی رویدا. دەڵێت: عومەر نامەی بۆ سەعد کوڕی وەقاص نوسی: کاتێك خواوەند دەست بەسەر شام و عێراقدا بگرێت، سوپایەك بۆ جەزیرە رەوانە بکە و فەرماندەییەکەی بەخالید کوڕی عورفەتە یا هاشم کوڕی عەتەبە یا عەیاز کوڕی غەنەم بسپێرە. سەعد وتی: سەروەری باوەڕداران (عومەر) لەبەر ئەوە ناوی عەیازی لەکۆتاییدا هێنا چونکە خۆشی دەوێت و من ئەو دەکەم بەفەرماندە. ئەو عەیازی رەوانە کرد و لەگەڵ ئەودا سوپایەك کە ئەبو موسا ئەشعەری کوڕەکەی خۆی عومەر کوڕی سەعد (دوایین بکوژی ئەبو عەبداللە حسێن کوڕی عەلی) لەناو ئەواندا بون. بەلاّم ئەم کوڕە هیچ کارە بو. عەیاز بەرێکەوت

سوپاکەی خۆی لە رەها جێگیر کرد. خەلکەکەی هاوشێوەی خەلکی حەران ئاشتیان کرد. عەیاز خۆی رۆشتە دارا و بەگرتنی ئەوێ سەرقاڵ بو. عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاصی بۆ ئەرمەنستانی چوارەم رەوانە کرد کە شەڕی خەلکەکەی کرد و لەم شەڕەدا بو صەفوان کوڕی موعەتەل کوژرا. عوسمان لەگەڵ خەلکی ئەو ناوچەیە لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی بەست. دواتر قیساریە لەوڵاتی فەلەستین دەستی بەسەرداگیرا و هراکلیوس هەلات.

بەپێی ئەم وتارە، دەست بەسەرداگرتنی جەزیرە لەناو دەست بەسەرداگرتنی سەرزەمینەکانی عێراق هەژمار دەکرێت بەلام زۆربەی مێژوونوسان بڕوایان وایە لەدەست بەسەرداگرتنی سەرزەمینەکانی شامە چونکە ئەبوعوبەیدە بۆ ئەنجامدانی، عەیاز کوڕی غەنەمی رەوانەی جەزیرە کرد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك زەمانی مردنی ئەبوعوبەیدە گەیشت، عەیاز کوڕی غەنەمی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. لەم کاتەدا نامەی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت کەئەوی بۆ فەرماندەیی حمص و قینسرین و جەزیرە دیاری دەکرد. ئەو لەنیوەی شەعبانی ساڵی هەژدەیەم/٢١ نوتی ٦٣٩ زایینی لەگەڵ پێنج هەزار پیاوی شەڕکەر بەرەو جەزیرە رۆیشت. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی ئەو، سەعید کوڕی عامر کوڕی جزیەمی جومەخی بو، فەرماندەی باڵی چەپ صەفوان کوڕی موعەتەل و فەرماندەی پێشەنگەکان هوبەیرە کوڕی مەسروق. پێشەنگەکانی عەیاز گەیشتنە رەقە و هێرشیان کردە سەر وەرزێرەکان و شارەکەیان گەمارۆدا. عەیاز شەڕکەرانی بۆ هێرش کردنە سەر ئەملاولا رەوانە کرد کەئەسیر و خواردنەکانیان بۆ هێنایەوە. گەمارۆدانی ئەوێ شەش رۆژی خایاند. خەلکی ئەو شارە خوازیاری ئاشتی بون. ئەو لەسەر بنەمای خۆیان و ژنان و منالەکان و شارەکە و هەمو سامانەکانیان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. عەیاز وتی: زەوی هی ئێمەیە کردمانە قەلغان و دەستمان بەسەردا گرت. ئەو زەویەکانی تەسلیمی ئەوان کردەوە تا باج بدەن. دواتر بەرەو حەران بەرێکەوت و سوپایەکی دیاری کرد تا گەمارۆی بدات. فەرماندەیی ئەم سوپایە بەصەفوان کوڕی موعەتەل و حەبیب کوڕی موسلیمە بو. ئەو خۆی رۆشتە رەها و لەوێ شەڕی کرد. خەلکی ئەوێ شکەستیان خوارد و هەلاتن و رۆشتنە ناو شارەکانی خۆیان و موسوڵمانەکان گەمارۆیان دان.

خەڵکەکەی خوازیاری ئاشتی بون و عەیاز ئاشتی لەگەڵ بەستن و بۆ حەڕان گەڕایەوە و بینی کەحەبیب و صەفوان بەسەر قەلا و دێهاتەکانی پەیوەست بەحەڕان زاڵ بون. لەگەڵ خەڵکەکەی ئەویّ هاوشێوەی خەڵکی رەها پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەستن.

عەیاز بەردەوام هێرشی دەکرد وبۆ رەها دەگەڕایەوە. ئەو دەستی بەسەر سومەیسات گرت و بەسەروج و راس کەیفا وسەرزەمینی سپی گەیشت و هاوشێوەی رەها پەیمانی لەگەڵ بەستن. دواتر خەڵکی سومەیسات پەیمانەکەی خۆیان شکاند. عەیاز دوبارە هێرشی کردە سەریان و گەمارۆیدان و دەستی بەسەر شارەکەیاندا گرت. دواتر رۆشتە گوندەکانی دەوروبەری فورات کە (جسر مەنبج) و دێهاتەکانی دەوروبەری بون. دەستی بەسەر ئەواندا گرت و رەوانەی رەئس عەین بو کەهەمان عەین ئەلوەردەیە. ئەم شارە لەبەرابەر ئەو سەرسەختیان لەخۆیان نیشاندا کەوازی لێهێنا و بەرەو تەل مەوزن بەرێکەوت و لەساڵی ١٩/٦٤٠ زایینی دەستی بەسەردا گرت و لەسەر بنەمای ئاشتی خەڵکی رەها پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. دواتر رۆشتە ئامێد و گەمارۆیدا. خەڵکەکەی بەشەڕ روبەروی بونەوە بەلام دواتر لەسەر بنەمای پەیمانی ئاشتی رەها پەیمانی ئاشتی لەگەڵدا بەستن. مەیافارقین و کوفر توسایشی بەمشێوەیە گرت. دواتر بەرەو نەسیبین بەرێکەوت کەخەڵکەکەی سەرەتا شەڕیان دەست پێکرد ودواتر پەیمانی ئاشتیان بەست. دوبارە توری عەبدین و قەلای ماردینی گرت و ئاهەنگی موسڵی کرد و یەکێك لەدوقەلاکەی گرت. دەستەیەك دەڵێن: بەویّ نەگەیشت. بەتریقی زۆزان هاتە لای ئەو و ئاشتی لەگەڵدا بەست. دواتر رۆشتە ئەرزەن و دەستی بەسەردا گرت و لەوێوە رۆشتە دەر و تێپەڕی و خۆی گەیاندە بەدلیس و دوای ئەوەی خیلات کەبەتریقەکەی پێشنیاری ئاشتی دا. دواتر لەئەرمەنستان بە(سەرچاوەی ترش) گەیشت و لەوێوە بۆ رەقە گەڕایەوە و رۆشتە حمص و لەساڵی٢٠/٦٤١ ماڵئاوایی لەژیان کرد.

دوای ئەو عومەر، سەعید کوڕی عامر کوڕی حزیەمی وەك فەرماندە دەست نیشان کرد کەزۆری نەخایاند و چاوی لەدنیا بەست. دواتر عومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری کردە فەرماندە. ئەو رەئس عەینی دوای شەڕێکی قورس گرت.

دەستەیەك دەڵێن: عەیاز، عومەیر کوڕی سەعدی رەوانەی رەئس عەین کرد کەدەستی

بەسەردا گرت و ئەمە دوای ئەوە بو کەشەڕێکی قورس لەم شارە دەستی پێکردبو.
دەستەیەك دەڵێن: دوای مردنی عەیاز، عومەر ئەبو موسای ئەشعەری رەوانەی رەئس عەین کرد. دەستەیەك دەڵێن: خالید کوڕی وەلید لەگرتنی جەزیرە هاوڕێیەتی عەیازی دەکرد و دواتر ڕۆشتە گەرماوێك لەئامەد و شتێکی لەخۆی سو کەشەرابی تێکەڵ کرابو. لەبەر ئەمە عومەر ئەوی لەسەر کارەکەی لابرد. دەستەیەك دەڵێن: خالید لەژێر ئالآی هیچ کەسێك جگە لەئەبوعوبەیدە شەڕی نەکرد و خوا زاناترە.
کاتێك عەیاز شارەکانی سومەیساتی گرت، حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ مەلەتیە نارد کەبەزۆری شمشێر دەستی بەسەردا گرت. دواتر خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی خۆیان شکاند. کاتێك معاویە دەستی بەسەر شام و جەزیرەدا گرت، دوبارە حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ ئەو ناوچەیە رەوانە کرد و بەزۆر داگیری کرد و سوپایەکی لەموسوڵمانان لەوێ جێگر کرد تا هاوڕێی فەرماندەکەی بن.

## لەسەر کار لابردنی خالید کوڕی وەلید

لەم ساڵەدا، یانی لەساڵی ٦٣٨/١٧ زایینی خالید کوڕی وەلید لەسەر کارەکەی خۆی کەفەرماندەیی ئەرتەش و سوپا پێشەنگەکان بۆ گرتنی شوێنە جۆراوجۆرەکان بو، لابرا.
هۆکارەکەی ئەمە بو کەئەو عەیاز کوڕی غەنەم بۆ شەڕی تورکەکان ڕۆشتنەدەر و سامانی زۆر و فراوانیان کۆکردبویەوە. ئەوان لەکاتی گەڕانەوەی عومەر لەجابیە بۆ مەدینە، لەم شارە هاتبونەدەر. فەرماندە و فەرمانڕەواکان و کارگوزارانی عومەر لەم کاتەدا ئەمانە بون: لەحمص ئەبوعوبەیدە کەخالید لەژێر فەرمانی ئەو لەقێنسرین بو، لەدەمشق یەزید، لەئوردون معاویە، لەفەلستین، عەلقەمە کوڕی موجزەر و لەکەرانە عەبدالله کوڕی قەیس. خەڵك ئاگادار بونەوە کەخالید چ سامانێکی گەورەی بەدەست هێناوە، لەبەر ئەمەکەسانێك ئاهەنگی ئەویان کرد تا لەبەخششەکانی ئەویان بەرکەوێت. یەکێك لەوان ئەشعەس کوڕی قەیس بو کەدەهەزار (درەمی) لێومرگرت.دواتر خالید رۆشتە گەرماو و شلەمەنیەکی لەجەستەی سو کەشەرابی تێکەڵ کرابو. عومەر بۆی نوسی: بیستومە سەر و روخسارت بەشەراب شۆردوە، خوا شەرابی نارەوا کردوە، چ بەنهێنی چ ئاشکرا چ تێهەڵسونی. لەتێهەڵسونی بەجەستەتان خۆتان

بەدور بگرن. خالید بۆی نوسی: ئێمە ئەومان کوشت و لەبەر ئەمە بوبە شلەمەنیەك هاوشێوەی بادە. عومەر بۆی نوسی: بنەماڵەی موغەیرە گرفتاری بێدادگەری بون، ئاگاداربە خوا لەسەر ئەم کردارە ئێوە نەمرێنێت.

کاتێك خالید ئەو سامانەی لەناو ئەوکەسانەی بەمەبەستی زێر پەرستی ئاهەنگی ئەویان کردبو، دابەش کرد، عومەر هەواڵی ئەم کارەی ئەوی بیست. عومەر کەسێکی بانگ کرد و هاورێ لەگەڵ ئەو بۆ ئەبوعوبەیدەی نوسی کەخالید لەناو کۆڕێکی گشتی دابنیشێنێت و دەست و پێی بەدەستارەکەی ببەستێتەوە و کڵاوەکەی لابرێت تا دان بەوەدا بنێت لەکوێوە دیاری بەئەشعەس داوە. لەسامانی خۆی داویەتی یا لەسامانە بەدەست هاتوەکان لەلەشکر کێشانە ئیسلامیەکان؟ ئەگەر دان بەوەدا بنێت کە لەسامانە بەدەست هاتوەکان لەلەشکرکێشیەکان بەدەستی هێناوە، دانی بەخیانەتەکەی خۆیدا ناوە و ئەگەر گومان بکات لەسامانەکەی خۆی داویەتی، زێدەڕۆیی کردوە و سنورەکانی بەزاندوە. هەرچی بڵێت و هەر بیانوێك بێنێتەوە ئەو لەسەر کارەکەی لابەرە و ناوچەی کار و فەرماندەیی و فەرمانڕەوایی ئەو خۆت بیگرە دەست. ئەبوعوبەیدە نامەی بۆ خالید نوسی و خالید رۆشتە لای. ئەبوعوبەیدە خەڵکی کۆکردەوە و رۆشتە سەر تەختی وتاردان. دواتر نێردراو هەستا و لەخالیدی پرسی: لەکوێ دیاریت بەئەشعەس داوە.؟ وەڵامی نەدایەوە. ئەبوعوبەیدەیش بێدەنگ بو و هیچی نەدەوت. بیلال هەستا و وتی: هەمانا سەروەری باوەڕداران سەبارەت بەتۆ ئەم فەرمانەی داوە. ئەو دەستاری لەسەر هەڵگرت و خالید لەروی کورنوش و فەرمانبردن هیچی نەوت. دواتر کڵاوەکەی لابرد و خستیە سەر زەوی. ئەوی هەستاند و دەست وپێی بەدەستارەکەی خۆی بەستەوە و وتی: لەکوێوە دیاریت بەئەشعەس داوە؟ لەسامانی خۆتت بەخشیوە یا لەوەی لەلەشکرکێشیە ئیسلامیەکان بەدەستت هێناوە؟ وتی: لەسامانەکەی خۆم بەخشیومە. لەم کاتەدا دەست و پێی ئەوی کردەوە و کڵاوەکەی کردە سەری و بەدەستی خۆی دەستارەکەی لەسەری ئاڵاند و دواتر وتی: فەرمانبەر و بچوکی فەرمانڕەواکانی خۆمان و کارگوزاری رێزدارکەری نۆکەرەکانی خۆمانین.

دەڵێت: خالید سەرگەردان مایەوە و نەیدەزانی لەسەر کار ماوە یا لابراوە. ئەبوعوبەیدەیش وەك رێز گرتنێك ئەمەی پێ نەدەوت. کاتێك رۆشتنەکەی بۆ لای

عومەر زۆری پێچو، زانی خالید لەچ سەرگەردانیەك دایە. لەبەر ئەمە نامەی بۆ خالید نوسی تا بڕواتە لای. خالید بۆ قێنسرین گەڕایەوە و قسەی بۆ خەڵك کرد و ماڵئاوایی لێکردن و گەڕایەوە بۆ حمص و بۆ فەرمانبردارانی خۆی لێرەیش قسەی کرد و بەردو مەدینە بەڕێکەوت. کاتێك گەشتە لای عومەر، پێی وت: لەتۆ لای موسوڵمانەکان گلەییم کرد چونکە سوێند بەخوا سەباردت بەمن بەچاکی هەڵس و کەوتت نەکرد. عومەر وتی: ئەم هەمو سامانەت لەکوێوە بەدەست هێناوە؟ وتی: لەو تالآنیانەی بەدەستم هێناوە و لەو بەشەی بەفەرمانی خۆت بەمنیان بەخشیوە. لەشەست هەزار دەرم زیاتر نیە. عومەر سامانەکەی ئەوەی هەڵسەنگاند و بینی کەبیست هەزار درەم زیاترە. ئەم بیست هەزار زیادیەی بۆ گەنجینە برد و دواتر وتی: ئەی خالید، سوێند بەخوا بێ گومان تۆ لای من بەرێز و لەدڵەوە خۆشم دەوێیت. نامەی بۆ هەمو شارەکان نوسی: من خالیدم لەبەر ئەوە لەسەر کار لانەبرد کەلێی تورە بم یا خیانەتی کردبێت، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوە بو خەڵك بەگەورەیان زانی و گرفتاری خۆشەویستی ئەوبون و من ترسام کارەکانی خۆیان بەو بسپێرن. حەزم کرد بزانن هەمو کارەکان خوا ئەنجامی دەدات و خەڵك نابێت ببنە نیشانە و مەبەستی ئاژاوەکان. عومەر قەرەبوی ئەوەی لێی وەرگرتبو، بۆ خالیدی گەڕاندەوە.

## دروست کردنی مسجد الحرام و فراوان کردنی

هەروەها لەم ساڵەدا، یانی ٦٣٨/١٧ زایینی عومەر حەجی عەمرەی بەجێهێنا ومزگەوتی حەرامی نۆژەن کردوە و فراوانی کرد. بیست شەو لەمەککە مایەوە و ماڵی ئەو کەسانەی بۆ فرۆشەکەی ئامادە نەبون، بەسەر ئەواندا خاپوری کرد و بەهای ماڵەکانیانی لەناو گەنجینەدا دانا تا هاتن و وەریانگرت. عومرەی ئەو لەمانگی رەجەب/ژوئیەی ٦٢٨ زایینیدا بو. ئەو زەید کوڕی سابتی کردە جێگری خۆی لەمەدینە. هەروەها فەرموی ستونەکانی حەرەم نۆژەن بکەنەوە. بۆ نۆژەن کردنەوەی ماڵی خوا ئەم کەسانەی هەڵبژارد: مەخرەمە کوڕی نەوفل، ئەزهەر کوڕی عەبدعەوف، حویتب کوڕی عەبدئەلعوزی و سەعید کوڕی یەربوع. خاوەن ئاوەکان داوای فەرمانێکیان لێکرد تا ماڵەکان لەنێوان مەککە و مەدینە دروست بکەن. ئەو فەرمانی پێدان و پەیمانی

لێوەرگرتن تا بزانن رێبوار شیاوترە بەناو و سێبەر.

## شەڕ لەگەڵ ئێران لەبەحرەین

دەڵێن: کاتێك ئەهواز و سەرزەمینەکانی دەوروبەری دەستی بەسەرداگیرا، عومەر بەردەوام دەیوت: حەزم دەکرد لەنێوان من و ئێران تەنافێك یاکێوێك لەئاگر دەبو کە نەئەوان دەیانتوانی لەوێوە خۆیان بەئێمە بگەیێنن و نەئێمە.
عەلا کوڕی حەزرەمی لەرۆژگاری خەلافەتی ئەبوبەکر فەرمانداری بەحرەین بو. عومەر ئەوی لەسەر کار لابرد و قودامە کوڕی مەزعونی لەجێگاکەی دانا، دواتر قودامەی لەسەر کار لابرد و عەلا ی هێنایەوە سەر کار. عەلا لەسەر کارەکان لەگەڵ سەعد کوڕی ئەبی وەقاص بەرابەری دەکرد. ئەو لەشەڕ دژی هەڵگەڕاوەکان لەئایینی ئیسلام، لەپێشی بەدەست هێنا. کاتێك سەعد بەسەر شەڕکەرانی قادسیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و خوسرەوەکانی لەسەر کار لابرد، کارێکی زۆر گەورەتری کرد. لەسەر ئەم بنەمایەبو کەعەلا ویستی لەبەرابەر ئێرانیەکان کارێك ئەنجام بدات بێ ئەوەی بڕوانێت گوناحە یا پەسەند. پێشتر عومەر بەلایەنگیری کردن لەپێغەمبەر(ص)ی خواوەند و ئەبوبەکر لەترسی زیان بەرکەوتن، ئەو و کەسانی دیکەی لەشەڕ کردن لەدەریا دور خستبویەوە. لەم کاتەدا عەلا خەڵکی بۆ شەڕ دژی ئێرانیەکان کۆکردەوە کەرازی بون و عەلا بەسەر چەندین سوپادا دابەشی کردن. یەکێك لەسوپاکان جارود کوڕی موعەل فەرماندەیی دەکرد، سوپایەکی دیکە سوار کوڕی هومام و سوپاکەیتر خولەید کوڕی مونزەر کوڕی ساوی و فەرماندەی هەمویان بەشێوەیەکی گشتی خولەیدی ساوی. ئەو بێ فەرمانی عومەر ئەوانی لەرێگای دەریاوە رەوانە کرد. سوپاییەکان لەبەحرەین تێپەڕیان کرد و بەرەو فارس رۆیشتن. ئەوان لەئیستەخر لەدەریا هاتنەدەر. ئێرانیەکان بەفەرماندەیی هیربۆد، لەبەرابەریاندا بون. ئێرانیەکان لەنێوان موسوڵمانەکان و کەشتیەکانی ئەوان دەستیان بەهێرش کردن کرد. خولەید لەناو خەڵکدا قسەی کرد و وتی: ئەم خەڵکە ئێوەیان بۆ شەڕ بانگێشت نەکردوە، ئێوەن هاتونەتە شەڕی ئەوان. زەوی و کەشتیەکان ملکی خوایە، کەواتە بەخۆڕاگری و نوێژ وزە بگرن و لەم دوانە هاوکاری وەربگرن کەهەردوکیان گرانن مەگەر بۆ لەخۆبوردوان (بقرە/٢/٤٥). ئەوان وەڵامی داواکەیان

دایەوە. دواتر نوێژی نیمەڕۆیان خوێند و ڕووبەڕویان بونەوە و لەشوێنێك بەناوی تاووس شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد کەجارود و سوار لەو شەڕەدا کوژران.

خولەید فەرمانی بەشەڕکەرانی خۆیدابو، پیادە شەڕ بکەن. ئەم کارەیان کرد و کوشتارێکی گەورەیان لەناو ئێرانیەکان دروست کرد و دواتر بەمەبەستی بەسرە هاتنەدەر بەڵام ڕێگەی دەریایان نەدۆزیەوە. ئێرانیەکان ڕێگەیان لێگرتن و ئەوان ئوردویان لێدا و پارێزگاریەکی گیانبڕیان لەخۆیان کرد.

کاتێك ئەم هەواڵە بەعومەر گەیشت کەعەلا چی کردوە، پەیك و پەیامی بۆ لای عەتەبە کوڕی عەزەوان ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا پێش لەناوچونی موسوڵمانان، سوپایەکی گەورە بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانەی ئێران بکات. عومەر پێش ڕودانی کارەکان وتی: دڵم دەڵێت ئەمە و ئەوە ڕودەدات. ئەو هەمو شتێکی بەڕاستی پێشبینی کردبو. فەرمانیدا لەسەر عەلا گرانترین بارەکان دابەزێنن: یانی کەوتنە ژێر فەرمانی سەعد کوڕی وەقاص.

عەلا لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی بەرەو لای سەعد بەڕێکەوت. عەتەبە سوپایەکی گەورەی پێکهاتو لەدوانزە هەزار شەڕکەری ڕەوانە کرد کەعاصم کوڕی عەمرۆ، عەرفەجە کوڕی هەرسمە، ئەحنەف کوڕی قەیس و کەسانیتر لەناویاندا بون. ئەوان سوار ئێسترەکان بون و ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا ڕادەکێشا. فەرماندەیی ئەوان لەدەستی ئەبو سەبرە کوڕی ئەبی ڕۆهم یەکێك لەپیاوانی بەنی عامر کوڕی لۆئەی دابو. ئەو خەڵکی بەدوای خۆیدا ڕەوانە کرد و بۆ سەر کەنارەکان ڕێنوێنی کردن بەشێوەیەك کەس نەیتوانی زیانیان پێبگەیێنێت. سەرئەنجام ئەبو سەبرە لەشوێنێك کەڕێگا لەسەر موسوڵمانان داخرابو، ڕوبەڕوی خولەیدی ساوی بویەوە و ئەمە ماوەیەك دوای شەڕی تاووس بو.

کاری شەڕ دژی موسوڵمانان تەنیا لەئەستۆی خەڵکانی ئیستەخردابو و چەندین کەسی لەملاولا پەیوەستی ئەوان ببون. خەڵکی ئیستەخر لەوشوێنەدا بون کەڕێگەیان لەموسوڵمانان گرتبو. ئەوان خەڵکی فارسیان کۆکردەوە کەلەهەر لایەکەوە هاتن و دوای شەڕی تاووس ڕوبەڕوی ئەبوسەبرە بونەوە. هێزە یارمەتیدەرەکان بۆ موسوڵمانان گەیشت. فەرماندەی ئێرانیەکان سەهرەك بو. شەڕ ڕویدا و خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و ئێرانیەکانیان کوشتار کرد و موسوڵمانان تا ئەو شوێنەی

دەیانتوانی ئەوانیان تالآن کرد. ئەمە ئەو شەڕە بو تیایدا گەنجەکان و مێردمندالآنی بەسرە خۆیان نیشاندا چونکە بەباشترین گەنجی شارەکان هەژمار دەکران. دواتر بەسامانە بەدەست هێنراوەکان گەڕانەوە. عەتەبە بۆ ئەوان نامەی نوسیبو و فەرمانیدابو لەکارەکەی خۆیاندا پەلە بکەن و ماتڵ نەبن. ئەوان تەندروست بۆ بەسرە گەڕانەوە.

کاتێك عەتەبە ئەهوازی گرت و فارسی کردە شوێنی مەبەستی خۆی، لەعومەر بۆ حەج کردن ئیزنی خواست. عومەر ڕێگەی پێدا. کاتێك حەجی کرد، داوای لەعومەر کرد ئەو لەکار ببەخشێت. عومەر رازی نەبو و سوێندی دا بێ چەند و چون بۆ سەر کارەکەی بگەڕێتەوە. ئەو لەخوا پاڕایەوە و گەڕایەوە بەلآم لە (بطن نخلە) مرد و بەخاك سپێردرا. هەواڵی مردنی ئەویان بەعومەردا و رۆشتە سەر گۆڕەکەی وتی: ئەگەر شارەزایەکی لێهاتوو نەبویتایە، دەتوت من تۆم بەکوشتن داوە. عومەر وەسفی کرد وبەچاکی ناوی برد. عەتەبە پیاوێکی ئەوەندە خۆپارێز بو کەوەك موهاجیرەکان ماڵێکی بۆ خۆی دروست نەکرد. منالەکانی ئەو ماڵەکەی خۆیان لەفاختەی کچی غەزەوان کەهاوسەری عوسمان کوڕی عەفان بو، بەمیرات بۆ مابویەوە. کۆیلەکەی ئەو حوباب شێوازی ئەوی گرتەبەر وماڵێکی بۆ خۆی دروست نەکرد. عەتەبە کوڕی غەزەوان لەسێ ساڵیدا لەکاتی جیابونەوە لەسەعد، مرد و ئەمە دوای ئەوە بوسوپاکەی فارسی لەمەرگ رزگار کرد ولە بەسرە نیشتەجێی کردن. ئەو ئەبو سەبرە کوڕی ئەبی رۆهمی وەك جێگری خۆی لەبەسرە دەست نیشان کرد کەعومەر تا کۆتایی ئەو ساڵە لەسەر کارەکەی هێشتیەوە. کەس لەگەڵ موغەیرە دەرگیر نەبو، ئەو کارێکی نەکرد شیاوی سەرکۆنە کردن بێت جگە لەوەی لەنێوان ئەو و ئەبوبەکرە رویدا. دواتر ئەبوموسای ئەشعەری وەك فەرمانداری بەسرە دیاری کرد. دواتر ئەوەی بۆ فەرمانداری کوفە رەوانە کرد. عومەر، دواتر ئەبو سوراقەی کردە فەرماندار و دواتر رەوانەی کوفەی کرد. دوبارە ئەبو موسای لەکوفەوە بردە بەسرە و بۆ دوەمین جار فەرمانداری پێسپێردرا. بیرەوەری فەرمانداری عەتەبە کوڕی غەزەوان لەبەسرە و جۆراوجۆری گێرانەوەکان لەمبارەوە، لەرواودوەکانی ساڵی ٦٢٥/١٤ زایینی ئاماژەمان پێدا.

## لەسەر کار لابردنی موغەیرە لەبەسرە و فەرماندارى ئەبو موسای ئەشعەری

لەم ساڵەدا موغەیرە کوڕی شەعبە لەفەرمانداری بەسەر لابرا و عومەر لەجیاتی ئەو، ئەبو موسای ئەشعەری وەك فەرمانداری ئەم شارە دەست نیشان کرد. فەرمانی پێدا موغەیرە کوڕی شەعبە بگەڕێنێتەوە بۆ لای ئەو لەمەدینە. ئەمە لەمانگی رەبیع الاول/نارسی٦٣٨ زایینی رویدا. واقدی ئاماژەی بەگێڕانەوەیەکی لەمشێوەیە داوە.

هۆکاری لەسەر کار لابردنی ئەوە بو کەلەنێوان ئەبوبەکرە و موغەیرە دوژمنایەتی لەئارادابو. ئەم دوانە دراوسێ بون و کۆلانێك لەیەك دور بون. ئەم دوانە روبەروی حەوزەکە بون کەهەرکام روبەروی ئەویتر دەلاقەیەکی هەبو. رۆژێك چەند کەسێك لەحەوزەکەی ئەبوبەکرە کۆبونەوە و دەستیان بەگفتوگۆ کرد. با هەڵیکرد و دەلاقەکەی کردەوە. ئەبوبەکرە هەستا تا بیبەستێت و بینی با دەلاقەکەی موغەیرەیشی کردۆتەوە. بینی موغەیەر لەناو رانی ژنێك دانیشتوە و بەردەوام دەیگێت. بەو چەند کەسەی وت، هەستن و سەیر کەن. ئەوان هەستان و سەیریان کرد. ئەمانە بون: ئەبوبەکرە، نافع کوڕی کەلەدە، زیاد کوڕی نوبیە (برای دایکی ئەبوبەکرە) و شبل کوڕی مەعبەدی بەجلی. بەوانی وت: شایەت بن. وتیان: ئەم ژنە کێیە؟ وتی: دایکی جەمیل کوڕی ئەفقەم. ئەم ژنە لەبەنی عامر کوڕی صەعصەعە بوکەدڕۆشتە ماڵی گەورەکان و موغەیرە و گانی بەوان دەدا. هەندێ لەژنان لەو زەمانەدا ئەم کارەیان دەکرد. کاتێك ژن هەستا، ئەویان ناسیەوە. کاتێك موغەیرە بۆ نوێژ رۆشتەدەر، ئەبوبەکرە لەپێشنوێژی ئەو رێگری کرد. ئەم ئەم بەسەرهاتەی بۆ عومەر نوسی. عومەر ئەبوموسای وەك فەرمانداری بەسرە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەشێوازی پێغەمبەر(ص) دورنەکەوێتەوە. ئەبو موسا وتی: دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بۆ هاوکاری کردنی من رەوانە بکە. عومەر وتی: هەر کەسێکت دەوێت لەگەڵ خۆت ببە. ئەو بیست و نۆ کەسی هەڵگرت و لەوان: ئونس کوڕی مالك، عیمران کوڕی حوصەین و هشام کوڕی عامر. لەگەڵ ئەوان رۆشت و گەشتە بەسرە و نامەی فەرمانداری خۆی نیشانی موغەیرەدا. ئەمە راشکاوترین و کورتترین نامەبو: بەلام دواتر، هەواڵێکی مەترسیدار

لەتۆ بەئێمە گەیشتوە. ئەبوموسام وەك فەرماندار رەوانە كرد. ئەوەی لەدەستی تۆدایە، بەوی بسپێرە و بەپەلە بگەرە لای من. موغەیرە كچێكی جوانی وەك دیاری بەناوی عەقیلە بەئەبو موسای بەخشی.

موغەیرە كۆچی كرد و هاورێ لەگەڵ ئەو ئەبوبەكرە و شایەتەكان بۆ مەدینە هاتن. ئەوان ڕۆشتنە لای عومەر. موغەیرە وتی: لەم كۆیلانە بپرسە چۆن منیان بینی. روم لەوان بو یا پشتم؟ ژنیان چۆن بینی و چۆن ناسیانەوە؟ ئەگەر رویان لەمن بو، چۆن خۆم دانەپۆشی و ئەگەر پشتم لەوان بو، چۆن بەڕەوایان زانی لەماڵەكەم سەیری ژنەكەم بكەن؟ سوێند بەخوا تەنیا لەگەڵ ژنەكەی خۆم هاوئامێز بوم! ژنەكەم هاوشێوەی دایكی جەمیلە. ئەبوبەكرە شایەتی دا كەموغەیرەی بەسەر دایكی جەمیلەوە بینیوە و هەردوكیانی لەپشتەوە بینیوە.؟ شبل و نافعیش شایەتیان دا. كار گەیشتە زیاد كوڕی ئوبیە (پێشتر، كاتێك هەر چواریان رۆشتنە ناو مزگەوت، یەك یەك رۆشتنە پێش) كاتێك زیاد رۆشتە ناو، عومەر هاواری كرد: پیاوێك دەبینم كەخوا لەسەر زمانی ئەو یەكێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) ریسوا ناكات. زیاد كوڕی ئوبیە وتی: موغەیرەم لەناو دوقاچی ژنێكدا بینی. دو پێی خەنە لێدراوی جوان تاشراوم بینی كەلەنێوان زەوی و ئاسمان تەكانیان دەخوارد. هەروەها دوكونی قنی روتم بینی و هاوار و ناڵەم بیست (ئاخ و ئۆف). عومەر پرسی: ئایا بینیت وەك میل لەسورمەدان بیخاتە ناو ئەو ژنەوە؟ زیاد وتی: نە. عومەر پرسی: ژنەكەت ناسیەوە؟ زیاد وتی: نە، بەلاَم ئەوم بەهاوشێوە هاتە بەرچاو. عومەر فەرموی: سێ شایەتەكە یەكی هەشتا قامچیان لێبدەن. موغەیرە وتی: دادی دڵی من لەم كۆیلانە وەربگرە. عومەر وتی: بێدەنگ بە، خوا بێدەنگت كات! سوێند بەخوا ئەگەر شایەتەكان دەبونە چوار، بەدەستی خۆم بەردبارانم دەكردی.

## گرتنی ئەهواز و مەنازێر و روباری تیری

لەم ساڵەدا یا ساڵی ٦٤١/٢٠ زایینی ئەهواز و مەنازێر و روباری تیری دەستیان بەسەرداگیرا.

داستانی گرتنەكەی بەمشێوە بو كەكاتێك هورموزان لەشەڕی قادسیە شكەستی خوارد و ئەو یەكێك لەحەوت بنەماڵە گەورەكەی ئێران بو ( و شوێنكەوتوانی ئەو لەوان

لەمێهرجانقەدەق و شارەكانی ئەهواز بون) ئاهەنگی خوزستانی كرد ودەستی بەسەردا گرت و هەر كەسێك روبەرویان دەبویەوە، شەڕیان لەگەڵ دەكرد. هورموزان هێرشی كردە سەر خەڵكانی میشان ودەشتی میشان لەمەنازێر و روباری تیری. لەم كاتەدا عەتەبە كوڕی غەزەوان داوای هاوكاری لەسعد كرد و ئەو نەعیم كوڕی موقەڕدن و نەعیم كوڕی مەسعودی بۆ هاوكاری كردنی ئەو ڕەوانە كرد و فەرمانی بەم دوانەدا لەسەرەوەی میشان و دەشتی میشان تێپەڕن بەشێوەیەك لەنێوان ئەوان و روباری تیریدا بن. هەروەها عەتەبە كوڕی غەزەوان، سولی كوڕی قین و حەرەملە كوڕی موریتەی ڕەوانە كرد كەلەموهاجیرەكان لەگەڵ پێغەمبەر(ص) ولەبەنی عەدویە و لەبەنی حەنزەلە بون. ئەم دوانە لەسنورەكانی میشان و دەشتی میشان لەنێوان ئەوان و مەنازێر دابەزین و بەنی ئەلعەمیان بانگ كرد. دواتر غالبی وایلی كەلیب كوڕی وایلی كەلیبی بەرەو لای ئەوان ڕۆشت و نەعیمیان لەپشتی خۆیانەوە بە جێهێشت و ڕۆشتنە لای سولی و حەرەملە و وتیان: ئێوە لەبنەماڵەكانن و ماڵتان نیە. كاتێك فلاّن وفلاّن رۆژ بگات، روبەروی هورموزان ببنەوە كەیەكێك لەئێمە دوانە هێرش دەكەینە سەر مەنازێر و ئەویترمان هێرش دەكاتە سەر روباری تیری. شەڕكەران دەكوژین و دواتر دەگەڕێینەوە بۆ لای ئێوە چونكە بۆ گەیشتن بەهورموزان بەخواستی خواوەند، ڕێگرێك نیە. گەڕانەوە و چاوەڕوانیان كرد و خەڵكەكەیان لەبەنی ئەلعەم كوڕی مالك وەلاّمیان دانەوە چونكە ئەوان پێش ئیسلام لەخوزستان دەژیان و ئەوانیان بەئەمین دەزانی. كاتێك ئەو شەوە یانی شەوی بەڵێن دراو گەیشت كەلەنێوان سولی و حەرەملە لەلایەك و غالب و كەلیب لەلایەكی دیكە بڕیاری لەسەر درابو( هورموزان لەم كاتەدا لەنێوان روباری تیری و دۆلۆس بو)، سولی و حەرەملە لەكاتی بەرەبەیان بەئامادەیی تەواو بۆ شەڕ كردن هاتنەدەر و نەعیم و هاورێكانی ئەویان بزواند(هەڵیان ساندن). ئەوان لەنێوان دۆلۆس و روباری تیری روبەروی هورموزان بونەوە. سەلی كوڕی قین فەرماندەیی خەڵكی بەسرەی لەدەستا بو و نەعیم كوڕی موقەڕدن فەرماندیی خەڵكی كوفە. شەڕ دەستی پێكرد.

لەو كاتەی ئەمان سەرقاڵی شەڕكردن بون لەناكاو هێزە یارمەتیدەرەكان لەلایەن كەلیب و غالبەوە گەیشتن و بەهورموزان هەواڵ گەیشت كەمەنازێر و روباری تیری هەردوكیان

دەستیان بەسەردا گیراوە. ئەم هەواڵە دڵی هورموزان و هاوڕێکانی ئەوان شکاند و خواوەند ئەوانی شکەست دا. موسوڵمانان هەرکەسیان ویست، لەوان کوشتیان و هەرچیان ویست، بەتاڵانی هەڵیان گرت. شوێن ئەوان کەوتن تا گەشتنە کەنارەکانی روباری دوجەیل و لەوێ بەم لاوە دەستیان بەسەر هەمو ناوچەکاندا گرت و لەبەرابەر بازاری ئەهواز ئوردویان لێدا. هورموزان لەپردی بازاری ئەهواز تێپەڕی کرد و مایەوە. دوجەیل کەوتە نێوان موسوڵمانان و هورموزان. کاتێك هورموزان شتێکی بینی نەیدەتوانی بەرگەی بگرێت، خوازیاری ئاشتی بو. ئەوان عەتەبەیان کردە فەرمانڕەوایی خۆیان. ئەو بەپێشنیاری ئاشتی ئەوان لەسەر بنەمای گرتنی ئەهواز و هەمو مێهرجانقەدەق، رازی بو. ئەمە جگە لەروباری تیری و مەنازێر و ئەو شوێنانە لەبازاری ئەهوازبو کەپێشتر دەستیان بەسەردا گرتبو و تەسلیمی ئێرانیەکان نەدەکرایەوە. سولی لەمەنازێر و پادگانە سنوریەکان دانا و غالبی کردە فەرماندەی ئەو شوێنانە. حەرمەلەی لەروباری تیری دانا و کاری فەرماندەیی بەکەلیب سپارد. ئەم دوانە فەرماندەیی پادگانە سنوریەکانی بەسرەیان دەکرد. چەندین خێڵ لە بەنی ئەلعەم کۆچیان کرد و لەبەسرە نیشتەجێ بون.

عەتەبە دەستەیەکی لەخەڵکان وەك وەفدی نوێنەرایەتی بۆ لای عومەر نارد کەسولی و ژومارەیەك لەخەڵکانی بەسرە لەناو ئەواندا بون. عومەر بەوانی فەرمو: کەنیازەکانی خۆیان بڵێن. هەمویان وتیان: چینی خەڵکان، تۆ خاوەنی ئەوانیت، هەمویان بۆ خۆیان داوای شتێکیان کرد جگە لەئەحنەف کوڕی قەیس کەشتێك هاتە سەرزمانی و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ بەو شێوەی کەئەوان باسیان کرد بەڵام هەندێ کات رودەدات شتێك لەتۆ شاراوە دەبێت و لەسەر ئێمە پێویستە تۆ ئاگادار بکەینەوە کەبەرژەوەندی چینی خەڵکانی تیا شاراوەیە. فەرمانڕەوا لەوەی لای ئەو شاراوەیە، بەچاوی ئاگاکان دەبینێت و بەگوێی ئەوان دەبیستێت. بزانە کەبراکانی ئێمە لەکوفە لەپیاڵەی ڕەشی چاوانی وشتر دابەزیون کەسەراسەری سەرچاوە دڵڕفێنەکانە و گوڵستانە سەرسەوزەکان. میوەیان پێدەگات بێ ئەوەی دەست بۆ چنین و کۆکردنەوەی ببەن. ئێمە خەڵکانی بەسرە لەزەویەکی سوێر و تەڕ و چاڵێکی قووڵ و شێدارەوە هاتوین. لایەکی لەبیاباندایە و لایەکی لەدەریایی خرۆشان. تیایدا شتێك ڕەوانە بەو ئەندازەی کەدبێت ڕەوان بێت

لەهەناسەی وشترمرەکان. ماڵەکانمان لێوانلێوە لەخەڵك و هۆکاری بژێوی ژیانمان کەم و سەرلێشێواو. پارەکەمان گەورەیە و نانەکانمان تەنك. خوا بەخشینەکانی بەئێمە بەخشیوە و توێشوی ئێمەی لەناو زەویەکانماندا پێداوین. تۆ ئەی سەروەری باوەڕداران، رۆژی بۆ ئێمە زیاد بکەو مانگانە یا ساڵانەیەك بۆ ئێمە دیاری بکە تا بەشی خەرجیەکانی ئێمە بکات و ژیانمان بسورێنێت. کاتێك عومەر وتارەکەی ئەوی بیست، چاکەی زیاتری لەگەڵ کردن و ئەو زەویانەی تایبەت بون بەبنەماڵەی خوسرەو، بەوانی سپارد و جیاواز لەوە بەخشینەکانی خۆی پێبەخشین. وتی: ئەم گەنجە، سەروەری خەڵکی بەسرەیە. بۆ عەتەبەی نوسی گوێ لەوتارەکانی بگرێت و لەبەکار بردنی بۆچونەکانی ئەو هەوڵ بدات. ئەو بەرێزەوە ئەوانی رەوانەی شارەکەیان کردەوە.

لەهەمان کات کەخەڵکان لەسەر بنەمای ئەمانی خۆیان لەگەڵ هورموزان هەڵس و کەوتیان دەکرد، لەنێوان هورموزان و غالب و کەلیب لەسەر سنوری زەویەکان دەرگیری و ناسازگاری رویدا. سولمی و حەرەملە هاتنە ئەوێ تا بزانن چی رویداوە. بینیان کەغالب و کەلیب راست دەکەن و هورموزان ناڕاست و بەلارێدا دەڕوات. لەنێوان ئەم دوانە و هورموزان جیایان دروست کرد. هورموزان رویکردە ناباوەڕی و ئەوەی لەژێر فەرمانیدابو، رێزی لێگرت و داوای هاوکاری لەکوردەکان کرد و سوپاکەی خۆی رازاندەوە. سولمی وهاورێکانی ئەو، ئەم هەواڵەیان بۆ عەتەبە نوسی و عەتەبە بەعومەری راگەیاند و عومەر بۆی نوسی و فەرموی ئاهەنگی هورموزان بکات. بۆ موسوڵمانانی بەسەرکردایەتی حۆرقوس کوڕی زوهەیری سەعدی هێزی پشتیوانی نارد. ئەم پیاوە لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بو. ئەوی کردە فەرماندەی هێزە شەڕکەرەکان و فەرمانڕەوایی ناوچە دەست بەسەرداگیراوەکان.

هورموزان و هاورێکانی بەرێکەوتن و موسوڵمانان بەرەو بازاری ئەهواز رۆیشتن. پەیامیان پێدا: یا بەلای ئێمەدا تێپەڕە یا ئێمە بەلای تۆدا تێدەپەڕین. وتی: بەلای ئێمەدا تێپەڕن. ئەوان بەسەر پردەکەدا تێپەڕیان کرد و لەو لا کەبازاری ئەهوازە، بۆ شەڕ ریزیان بەست. هورموزان شکەستی خوارد وبۆ رامهۆرمۆز رایکرد. حۆرقوس دەستی بەسەر بازاری ئەهوازدا گرت و لەوێ دابەزی. ئەم ناوچەیە تا شوشتەر بۆ ئەو فراوان بو. ئەو باجی لەسەر دیاری کردن و هەواڵی سەرکەوتنی خۆی بۆ عومەر نوسی و پێنج

یەکی بۆ ڕەوانە کرد.

## ئاشتی هورموزان و خەڵکی شوشتەر لەگەڵ موسوڵمانان

لەم ساڵەدا یا ساڵی ٦٣٧/١٦ زایینی یا ساڵی ٦٤٠/١٩ زایینی شوشتەر دەستی بەسەرداگیرا. دەڵێن: کاتێك هورموزان لەشەڕی بازاری ئەهواز شکەستی خوارد و موسوڵمانان دەستیان بەسەردا گرت، حۆرقوس، جەزە کوڕی معاویەی بەفەرمانی عومەر بەدوای ئەودا ڕەوانەی بازاری ئەهواز کرد. ئەو بەردەوام ئەوانی دەکوشت تا گەیشتە بازاری شعر. هورموزان ئەوی ناتەوان کرد. جەزە ڕوی کردە دەورەق یانی شاری سورەق و زۆر بەئاسانی گرتی و پێشنیاری دانی باجی بەهەڵاتواندا. ئەوان بەپێشنیارەکەی رازی بون و ئەو ئەم هەواڵەی بۆ عومەر و عەتەبە نوسی. عومەر بۆ حۆرقوس و بۆ ئەوی نوسی کە لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە تا دوایین فەرمانەکان بەوان بگەیێنێت. جەزە شارەکانی ئاوەدان کردەوە و لقی لەروبارەکان وەرگرت و زەویە مردوەکانی زیندو کرد. هورموزان پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان نارد و خوازیاری ئاشتی بو. عومەر بەم پێشنیارە رازی بو لەسەر ئەو بنەمایەی ئەوەی موسوڵمانان دەستیان بەسەردا گرتوە، لەدەستی ئەواندا بمێنێتەوە. دواتر لەسەر ئەم بنەمایە پەیمانی ئاشتیان بەست. هورموزان بەبەهێزی مایەوە و موسوڵمانان لەو کاتەی خەڵکی کورد ئاهەنگی ئەویان کرد، پارێزگاریان لێکرد و ئەو بۆ لای موسوڵمانان هاتوچۆی دەکرد. حۆرقوس لەکوێستانەکانی ئەهواز دابەزی. بۆ خەڵك دژوار بۆ هاتوچۆی بکەن. هەواڵی ئەم کارە بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت. عومەر بۆ حۆرقوسی نوسی: دابەزە و لەدەشتاییەکاندا بمێنەرەوە. کار لەسەر هیچ موسوڵمانێك بەدژواری مەگرە. لاوازی و پەلە کردن بەسەر تۆدا زاڵ نەبێت کەئەم دنیات لێ تاریك دەکات و ئەو دنیات لێ دەستێنێت. حۆرقوص تا شەڕی صەفین زیندو مایەوە و لەشەڕی نەهرەوان لەگەڵ خەواریج هاورێ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب شەڕی کرد.

## دەست بەسەرداگرتنی رامهۆرموز و شوشتەر و ئەسیر کرانی هورموزان

بەپێی گێڕانەوەکان، دەست بەسەردا گرتنی رامهورموز و شوشتەر و شوش لەساڵی ٦٣٨/١٧ زایینی یا ١٩/٦٤٠زایینی یا ٦٤١/٢٠ زایینی بو.

داستانی گرتنەکەی بەمشێوە بو کەیەزدگێرد لەکاتی ژیانی کردنی لەمەرو، بەردەوام خەڵکی فارسی هاندەدا کەداخ و خەم بخۆن چونکە پاشای کیانی لەدەستیان ڕۆشتوە. ئەوان کەوتنە جموجۆڵ و دەستیان بەنامەنوسین بۆ یەك کرد و لەگەڵ خەڵکی ئەهواز یەکیان گرت تا هاوکاری یەکتر بکەن. هەواڵی ئەم جموجۆڵانە بەزوهەیر و جەزە و سولی و حەرەملە گەیشت. ئەوان عومەر کوڕی خەتابیان ئاگادار کردەوە. عومەر بۆ سەعدی نوسی: سوپایەکی گەورە بەسەرکردایەتی نەعمان کوڕی موقەرن بۆ ئەهواز رەوانە بکە و لەم کارەدا پەلە بکە و فەرمانیان پێبدە رەوانە ببن و لەبەرابەر هورموزان دابەزن و بەتەواوی لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانی ئەو بکەن. هەروەها بۆ ئەبوموسای ئەشعەری نوسی: سوپایەکی گەورە بەفەرماندەیی سەهل کوڕی عودەی (برای سوهەیل) رەوانە بکە و بەرا کوڕی مالك و مەجزا کوڕی سەور و عەرفەجە کوڕی هەرسیمەی لەگەڵدا رەوانە بکە. فەرماندەیی بەسریەکان و کوفیەکان، هەموی لەدەستی ئەبو سەبرە کوڕی رۆهمدا بێت.

نەعمان کوڕی موقەڕن لەگەڵ خەڵکی کوفە هاتەدەر وبەرەو ئەهواز بەرێکەوت. ئەوان سوار ئێستر بون و ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا. ئەو حۆرقوس و حەرەملە و سولی لەپشت سەری خۆیەوە بەجێهێشت و بۆ شەڕی هورموزان ڕۆیشت کە لەرامهۆرموز بەسەری دەبرد. کاتێك هورموزان لەهاتنی نەعمان ئاگادار بویەوە، بۆ شەڕ دەسپێشخەری کرد و هیوایی خواست بەهاوکاری خەڵکی فارس رێگەی لێبگرێت و لەناوی بەرێت. نەعمان و هورموزان لەئەربەك روبەروی یەك بونەوە و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. دواتر خوای گەورە هورموزانی شکەستدا و بۆ شوشتەر هەڵات. نەعمان بەرەو رامهورموز بەرێکەوت و لەوێ دابەزی و بەرەو ئیزەج ڕۆیشت. تیرویە لەسەر ئیزەج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و نەعمان بۆ رامهورموز گەڕایەوە و لەوێ

نیشتەجێ بو. خەڵکی بەسرە گەیشتن و لەبازاری ئەهواز دابەزین و ئاهەنگی رامهورموزیان کرد. ئەوکاتەی لەبازاری ئەهواز بون، هەواڵیان پێگەیشت کەهورموزان گەیشتۆتە شوشتەر. ئەوان بەرەو لای ئەو بەرێکەوتن و نەعمانیش بەرێکەوت. حۆرقوس و حەرەملە و سولی و جەزەیش بەرێکەوتن و لەشوشتەر کۆبونەوە. هورموزان و سوپاکەی لەخەڵکی فارس و کوێستان و ئەهواز لەوێ لەسەنگەرەکان بۆ شەڕ وەستابون. عومەر ئەبوموسای ئەشعەری بۆ هاوکاری ئەوان رەوانە کرد و ئەوی کردە فەرماندەی بەسرەییەکان. سەرکردەی هەمویان ئەبو سەبرەبو. ئەوانیان بۆ ماوەی یەك مانگ گەمارۆدا وکەسانی زۆریان لەوان کوشت. بەرائ کوڕی مالك، برای ئونس کوڕی مالك، لەکاتی گەمارۆدان سەد شەڕکەری کوشت و ئەمە جیاواز لەو کەسانەبو کەجەزە لەمشوێنە کوشتبوی. هەروەها مەجزائ کوڕی سەور و کەعب کوڕی سەور و چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە و بەسرەیش کوشتاریان کرد. ئێرانیەکان لەرۆژەکانی شەڕی شوشتەر هەشتا شەڕیان لەگەڵ ئەوان رێکخست کەهەندێ کات لەبەرژەوەندی ئەوان دەشکایەوە و هەندێ کات بەزیانیان. لەدوایین پێشکەوتن کەشەڕێکی قورس رویدا، موسوڵمانان وتیان: ئەی بەرائ ، لەخوا بپاڕێرەوە تا ئەوان شکەست بدات. بەرائ وتی: ئەی خوایە، لەبەرژەوەندی ئێمە ئەوان شکەست بدە و من بخەرە ریزی گیانبەخشەکان. ئەو لەلایەن خواوە وەڵامی پێدرایەوە. موسوڵمانان ئەوانیان شکەست دا و بۆ ناو سەنگەرەکانی خۆیان پاشەکشێیان پێکردن. دواتر هێرشیان برد و ئێرانیەکان رۆشتنە ناو شارەکان و موسوڵمانەکان ئەوانیان گەمارۆدا.

لەم کاتەدا کەئەوان شەڕیان دەکرد وشار لەوان بێزار ببو و شەڕەکانیان زۆری خایاند، پیاوێك رۆیشتە لای نەعمان و داوای ئەمانی لێکرد لەسەر ئەو بنەمایەی رێگە چونە ناوشاری نیشان بدات. بۆ ئەبوموسا تیرێکی هاویشت بەم پەیامەکە: ئەگەر ئەمان بەمن بدەن، رێگەیەتان نیشان دەدەم کە دەتوانن برۆنە ناو شارەکە. موسوڵمانان زوبینێکیان رەوانە کرد و ئەمانیان پێبەخشی. تیرێکی دیکەی هاویشت و وتی: لەجێگەی هاتنەدەرەوەی ئاو هێرش بەرن کەدێنە ناو. نەعمان خەڵکی بۆ پێشڕەوی کردن هاندا. عامر کوڕی عەبد قەیس و دەستەیەکی بەرچاو هەنگاویان بردە پێش و شەوانە هێرشیان برد. نەعمان هاورێکانی هاندا تالەگەڵ ئەو پیاوەدا رەوانە ببن تا ئەوان بۆ

شوێنی ڕۆشتنە ناو شار ڕێنوێنی بکات. دەستەیەکی فراوان خۆبەخشانە ئامادە بون. ئەوان لەگەڵ خەڵکی بەسرە لەشوێنی ڕۆشتنە ناو روبەروی یەك بونەوە. ڕۆشتنە ناو کارێزەکە و خەڵك لەدەرەوە مانەوە. کاتێك ڕۆشتنە ناو شار، لەوێ تەکبیریان وت و موسوڵمانان لەدەرەوە تەکبیریان وت و درگاکان کرانەوە. موسوڵمانان چابوکی و چالاکیان کرد و شەڕکەرانیان لەخەودا کوشت. هورموزان ئاهەنگی قەلاکەی کرد و تیایدا خۆی شاردەوە وئەوانەی ڕۆشتبونە ناو قەلاکە لەدەوری ئەو کۆبونەوە. ئەو لەسەر بنەمای فەرمانی عومەر ڕۆیشتە لای ئەوان. بەتوندی بەستیانەوە و ئەوەی خوا بەخشیبوی، دابەشیان کرد. بەسوارەکان سێ هەزار درەم برا و بۆ پیادەکان هەزار. ئەو پیاوە تیرهاوێژە و ئەو پیاوەی خۆی هاتبوەدەر ئەمانیان پێدرا و هەروەها ئەو کەسانەی دەرگایان لەسەر خۆیان داخستبو.

لەو شەوەدا لەئێرانیەکان دەستەیەکی زۆر کوشتار کران. لەو کەسانەی بەدەستی هورموزان کوژران، مەجزئ کوڕی سەور و بەرئ کوڕی مالك بو. ئەبوسەبرە خۆی شوێن هەڵاتوان کەوت و تا شوش بەداویاندا ڕۆیشت و لەوێ دابەزی و نەعمان کوڕی موقەڕن و ئەبو موسا ئەشعەری هاورێی ئەوبون. هەواڵی ئەم کارەیان بۆ عومەر نوسی و ئەو بۆ ئەبو موسای نوسی و فەرمانی پێدا بۆ بەسرە بگەڕێتەوە. ئەمە سێیەمین جار بو. هەروەها ئەو کەسانی لەدەوری شوش بون بۆ بەسرە گەڕانەوە.

دواتر زێڕ کوڕی عەبداللە کوڕی کولەیبی فوقەیمی ڕەوانەی جوندیشاپور بو و لەوێ دابەزی. ئەو لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بو. عومەر فەرماندەیی سوپای بەسرەی بەموفتەریب یانی ئەسوەد کوڕی ڕەبیعە یەکێك لەپیاوانی بەنی ڕەبیعە کوڕی مالك سپارد. هەردوك لەموهاجیرەکان بون. ئەسوەد بەنوێنەرایەتی هاتبوە لای پێغەمبەر(ص) و پێی وتبو: هاتوم تا بەهاورێیەتی تۆ لەخوا نزیك ببمەوە. لەبەر ئەمە پێغەمبەر(ص) ئەوی بەموفتەریب (یانی ئەو کەسەی خوازیاری نزیك بونەوە لەخوایە) ناوبرد.

ئەبوسەبرە دستەیەکی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب نارد کەئونس کوڕی مالك و ئەحنەف کوڕی قەیس لەناویاندا بون و هورموزانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. ئەویان بردە مەدینە و جل وبەرگە بەزێر چنراوەکەیان لەبەر کرد و تاجە

گەوهەر نیشانەکەیان خستە سەر و رازاندیانەوە تا عومەر و موسوڵمانان ببینن. بەدوای عومەردا گەڕان بەڵاّن نەیاندۆزیەوە. سەبارەت بەو پرسیاریان کرد و پێیان وترا کە: لەمزگەوت لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتی کوفە کۆبۆتەوە. ئەویان لەمزگەوت بینی کەکلاّوە گەورەکەی خۆی خستبوە ژێر دەستی وپشتی پێ بەستبو. کاتێك دەستەی نوێنەرایەتی کوفە هەستان، کلاّوەکەی خستە ژێر سەری و خەوت و قامچیەکە لەدەستیدابو. هورموزان وتی: کوا عومەر؟ وتیان: ئەوەتا. وتی: دەرگاوان و پاسەوانەکانی کوان؟ وتیان: دەرگاوان و پاسەوان و دەبیری نیە. وتی: دەبێت پێغەمبەر(ص) بێت. وتیان: شوێنکەوتەی پێغەمبەر(ص)انە.

عومەر لەدەنگی گفتوگۆی خەڵکان ئاگادار بویەوە. هەستا و ڤینج دانیشت و دواتر سەیری هورمزانی کرد و وتی: هورمزان؟ وتی: بەڵێ. وتی: سوپاس بۆ خوا کە ئەم پیاوە و کەسانی هاوشێوەی ئەمی بەئیسلام سوك و ریسوا کرد. دواتر فەرموی: هەمو زێر و زیو و هەمو ئەو شتانەی بۆ رازاندنەوە بەکاری دەبرد لەگەڵ تاجەکەی لێی وەربگرن. ئەویان روت کردەوە و جلێکی ئەستوریان لەبەر کرد. دواتر عومەر پێی وت: ئەی هورموزان، ئەنجامی پەیمان شکێنی وئەنجامی کاری خوات چۆن بینی؟ هورموزان وتی: ئەی عومەر، ئێمەو ئێوە لەرۆژگاری جاهلی بەم شێوەیە بوین کەخوا ئێمەی بەسەر ئێوەدا زاڵکردبو و ئێستا چونکە خوا لەگەڵ ئێوەیە، بەسەر ئێمەدا زاڵبون. دواتر عومەر پرسی: چ بیانوێکت هەیە کەچەندین جار پەیمانت شکاندوە؟ هورمزان وتی: دەترسم پێش ئەوەی ئاگادارت بکەمەوە، تۆبمکوژیت. عومەر وتی: لەوە مەترسە. هورموزان داوای ئاوی کرد کەلەقاپێکی قوولّ بۆیان هێنا. هورموزان وتی: ئەگەر لەتینواندا بمرم ناتوانم لەقاپێکی ئاوا پیس و گەورە ئاو بخۆمەوە. ئاویان لەقاپێکدا بۆ هێنا کەپەسەندی کرد. هورموزان وتی: دەترسم ئەو کاتەی ئاو دەخۆمەوە تۆ بمکوژیت. عومەر وتی: تا ئەو ئاوە نەخۆیتەوە، لەخۆت مەترسە. هورموزان قاپەکەی سەرەوخوار کرد و ئاوەکەی ڕشت. عومەر وتی: جارێکی دیگە ئاوی بۆ بێنن و با تینویەتی و مەرگ پێکەوە نەچێژێت. هورموزان وتی: من پێویستم بەئاو نیە. ویستم بەم کارە ئەمان وەربگرم( وتت تا ئاوەکە نەخۆیتەوە تۆ ناکوژم ومن ئاوەکەم ڕشت و تۆ ناتوانی من بکوژیت)عومەر وتی: بەناچاری تۆ دەکوژم. هورموزان وتی: تۆ ئەمانت پێدام. عومەر

وتی: درۆ دەکەیت. ئونس وتی: راست دەکات ئەی سەروەری باوەرداران تۆ ئەمانت پێ بەخشی. عومەر وتی: ئەی ئونس ئایا بکوژی مەجزئ کوڕی سەور و بەرائ کوڕی مالك (براکەی خۆت) ئەمان ببەخشم! دواتر روی کردە هورموزان و وتی: سوێند بەخوا دەبێت رێگە چارەیەك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزیتەوە وگەرنە بێ گومان دەتکوژم. هورموزان وتی: وتت تۆناکوژم تا ئاگادارم بکەیتەوە و ترست لەسەر نیە تا ئاوەکە دەخۆیتەوە. دەوروبەریش بەعومەریان وت: راست دەکات ئەمانت پێدا. عومەر روی کردە هورموزان و وتی: تۆ منت فریودا. سوێند بەخوا فریو نادرێم بەڵکو دەبێت باوەر بێنیت وەگەر نەدەتکوژم. ئەو باوەڕی هێنا. عومەر دو هەزار درەمی بۆ بەسەر بردنی ژیان بۆ دیاری کرد و لەمەدینەماڵێکی پێدا. وەرگێرەکەی لەم ناوەدا موغەیرە کوڕی شەعبە بو کەکەمێك فارسی دەزانی و وتەکانی بۆ هەردولا وەردەگێڕایەوە تا وەرگێریان هێنا.

عومەر بەو دەستە لەخەڵکی وت: ئەگەری هەیە موسوڵمانان ئەو کەسانەی ئەمانیان پێدراوە، ئازاریان دەدەن لەبەر ئەوەیە ئەوان بەردەوام پەیمان دەشکێنن. وتیان: ئێمە جگە لەچاکە ناکەین. وتی: ئەی بۆ بەمشێوەیە؟ کەس وەڵامی رازی کەری نەدایەوە جگە لەئەحنەف کەوتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ رێگری لەرۆشتنە ناوەوەی ئێمە بۆ قوڵایی ئەم سەرزەمینە و جیاواز لەوە هێشتا پاشای ئێران لەناو ئێرانیەکانە و تا ئەو کاتەی ئەو لەناو ئەواندا بێت، ئەوان بەردەوام شەڕی ئێمە دەکەن چونکە دوپاشا لەیەك وڵات جێگەیان نابێتەوە تا یەکیان ئەویتریان دەردەپەڕێنێت. تۆ دەزانی ئێمە ئەم سەرزەمینانەمان یەك لەدوای یەك نەگرت مەگەر ئەوەی پەیمان شکێنیان کرد و دژی ئێمە راپەرین. ئەوە پاشای ئەو خەڵکەیە هانیان دەدات. کاری ئەوان بەردەوام ئەمە دەبێت تا فەرمان بەئێمە بدەیت کەسنورەکانی ئەوان ببڕین و بڕۆینە قوڵایی وڵاتەکەی ئەوان و پاشاکانیان لەناو بەرین و لەم کاتەدایە رشتەی هیوایی ئێرانیەکان دەپچڕێت. عومەر وتی: سوێند بەخوا راستت کرد! ئەو نیازەکانی ئەوانی بەراوەرد کرد و ئەوانی رەوانە کرد. لەم کاتەدا نامەیەك بۆ عومەر هات و ئاگاداریان کردەوە کەخەڵکی ئەهاوەند کۆبونەتەوە و بۆ شەڕ ریزیان بەستوە. ئەو فەرمانیدا سوپای موسوڵمانان تا قوڵایی سەرزەمینی ئێران پێشڕەوی بکەن.

بەوتەی دەستەیەك لەمێژوو نوسان محەممەد كوڕی جەعفەر كوڕی ئەبی تالب لەشەڕی شوشتەر كوژرا.

## دەست بەسەردا گرتنی شوش

دەڵێن: كاتێك ئەبوسەبرە ڕۆیشتە شوش و شەهریاری برای هورموزان لەم شارەدا بو، موسوڵمانان ئەم شارەیان گەمارۆدا و چەند جارێك شەڕی خەڵكەكەیان كرد. هەمو جارەكان خەڵكی شوش سەركەوتنیان بەدەست دەهێنا. لەم كاتەدا خۆپارێزەكان و قەشەكان لەسەرەوە هاواریان لەموسوڵمانەكان كرد و وتیان: ئەی عەرەبەكان، ئەوەی زاناكانی ئێمە بۆ ئێمەیان بەیادگار جێهێشتوە، ئەوەیە كە شوش( جگە لەسەر دەستی پیاوێكی زۆر فریوكار ((دەجال)) ) یا ئەو كەسانەی دەجال لەناو ئەواندا بێت، دەستی بەسەردا ناگیرێت و ئەگەر ئەو لەناو ئێوەدایە، دەتوانن شارەكە بگرن. ئەبو موسا لەشوشەوە بۆ بەسرە ڕۆیشت (لەبەسرەوە بۆ شوش ڕۆیشت) و موقتەریب كوڕی رەبیعە جێگەی ئەوی لەفەرمانڕەوایەتی خەڵكی بەسرە گرتەوە. ئێرانیەكان لەنەهاوەند كۆبونەوە. نەعمان فەرماندەیی خەڵكی كوفەی لەدەستا بو و هاوڕێ لەگەڵ ئەبو سەبرە گەمارۆی شوشیان دابو. زێر خەڵكی جوندیشاپوری گەمارۆدابو. نامەی عومەر گەیشت كەنەعمانی لەوێ هەڵگرت و بۆ شەڕی خەڵكانی نەهاوەند دەست نیشانی كرد. ئەو پێش ڕۆیشتن، شەڕی خەڵكانی شوشی كرد. خەڵكەكەی هاواریان لەموسوڵمانان كرد و شەڕی ئەوانیان كرد و توڕەیان كردن. لەم كاتەدا (صاف) هاتەسەر دەروازەی شوش و بەشەق تێی هەڵدا و بەتوڕەییەوە وتی: بكرێرەوە قوز هەڵپچڕاو! لەناكاو زنجیرەكان كرانەوە و موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو. ئێرانیەكان كەل و پەلی شەڕیان دانا و كەوتنە سەر چۆك و هاواریان كرد: ئاشتی، ئاشتی. موسوڵمانان دوای ئەوەی ئەو شارەیان بەزۆر گرتبو، بەپێشنیاری ئاشتیەكی ئەوان رازی بون و ئەوەی بەدەستیان هێنا، لەناو خۆیاندا دابەشیان كرد.

بە ئەبوسەبرەیان وت: ئەمە جەستەی دانیالی پێغەمبەر(ص)ە كە لەم شارەدا بەخاك سپێردراوە. وتی: من كارم پێی چیە.

دانیال دوای بەخت ئەلنصر بۆ پێغەمبەر(ص)ی نێردرابو و لەناوچەكانی فارس

مابویەوە. کاتێك سەردەمی مەرگی گەیشت و کەسی باوەڕداری نەبینی، نوسراوی خوای بەرێزدارتر لەناباوەڕان لەقەڵەمدا و بەکوڕەکەی وت: بڕۆ قەراغ دەریا و ئەم نوسراوە بخەرە ناو دەریا. کوڕ هەڵیگرت و لەبەرچاوی باوکدا نەما و دواتر گەڕایەوە و وتی: ئەو کارەم کرد. دانیال وتی: دەریا چی کرد؟ وتی: هیچی نەکرد. دانیال توڕە بو وتی: ئەوەی پێم وتی ئەنجامت نەداوە. کوڕە هەستا و کارەکەی باوکی ئەنجامدا. دانیال وتی: دەریات چۆن بینی. وتی: جۆشا و خرۆشا. دانیال لەجاری یەکەم توڕەتر بو و وتی: ئەوەی پێم وتیت، ئەنجامت نەداوە. کوڕە گەڕایەوە بۆ لای دەریا و نوسراوەکەی خستە دەریا. دەریا قەڵشتی برد و باوەشی کردەوە تا زەوی دەرکەوت و وەك تەنور قەڵشتی برد. نوسراوەکە ڕۆشتە خوار، زەوی هاتەیەك و دوبارە ئاو دایپۆشی. کاتێك ئەمجارە کوڕ گەڕایەوە و لەوەی بینیبوی، ئاگاداری کردەوە، وتی: ئێستا ڕاستت کرد. دانیال لەشوش مرد. جەستەکەی لەوێ بو و خەڵك لەپیرۆزی جەستەکەی داوای بارانیان دەکرد. داوای فەرمانیان لەعومەر کرد و فەرمانیدا تا بەخاکی بسپێرن.

هەروەها سەبارەت بەشوش وتویانە: یەزدگێرد دوای شەڕی جەلەولا، بەرێکەوت و لەئیستەخر دابەزی و (سیاە) هاورێ لەگەڵ حەفتا لەگەروەکانی ئێران هاورێیەتیان دەکرد. ئەو سوپاکەی ڕەوانەی شوش کرد و هورموزانی ڕەوانەی شوشتەر. سیاە لەکەلتانیە دابەزی. هەواڵی شەڕی جەلەولا و دابەزینی یەزدگێرد لەئیستەخەر بەگوێی خەڵکی شوش گەیشت. ئەوان داوای ئاشتیان لەئەبو موسا ئەشعەری کرد کەگەمارۆیدابون. ئەبو موسا لەگەڵ ئەوان ئاشتی کرد و دواتر بەرەو ڕامهۆرموز و لەوێوە بەرەو شوشتەر ڕۆیشت. سوپا لەنێوان ڕامهورموز و شوشتەر دابەزی و هاورێکانی خۆی لەگەورەکانی ئێرانی بانگ کرد و بەوانی وت: ئێوە دەزانن بەردەوام گفتوگۆی ئەوەمان دەکرد کەئەم خەڵکە بەزویی بەسەر ئەم وڵاتەدا زاڵ دەبن و چوارپێکانیان لەناو کۆشك و ئەیوانەکان پیسایی دەکەن و ئەوان ئەسپەکانیان بەدارە کاجەکانی ئێوە دەبەستنەوە. ئەوان بەسەر ئەو ئەندازە لەوڵات کەدەزانن، زاڵبون و ئەم کارانەیان ئەنجام داوە. ئێستا لەچارەنوسی خۆتان بڕوانن و هەر کارێك دەتانەوێت ئەنجامی بدەن. وتیان: بۆچونمان لەگەڵ تۆ یەکە. وتی: بۆچونم وایەباوەڕ بەدینەکەی ئەوان بێنن.

ئەوان شیرویەیان لەگەڵ دەکەس لەئەسوارەکان بۆ لای ئەبو موسا رەوانە کرد. پەیمانی لێسەندن کەهاوریٚ لەگەڵ ئەو شەڕی ئێرانیەکان بکەن و دەست لەشەڕ کردن دژی عەرەبەکان هەڵبگرن. بەڵێنی بەواندا لەبەرابەر شەڕی عەرەبەکان بیانپارێزن و لەهەر شوێنێك بیانەوێت نیشتەجێ ببن و لەباشترین بەخششەکان کەڵك وەربگرن و عومەر بەڵێن دەدات هەرچیان بوێت بەوانی ببەخشێت و لەبەرابەردا ئەوان باوەڕ بێنن. ئەوەی ویستیان، عومەر بەوانی بەخشی. ئەوان باوەڕیان هێنا و لەگەڵ موسوڵمانەکان گەمارۆی شوشتەریان دا. سیاه رۆیشتە نزیکی یەکێك لەقەڵاکان کەموسوڵمانان گەمارۆیاندابو. ئەو جل وبەرگی ئێرانیەکانی لەبەر کرد و خۆی هاوشێوەی ئەوان چاك کرد و جلەکانی خۆی خوێناوی کرد. خەڵکی قەڵاکە ئەویان لەخاك و خوێندا بینی و گومانیان کرد یەکێك لەخۆیانە کەبریندار بوە. درگای قەڵاکەیان کردەوە تا بیبەنە ناو. ئەو هەستایە سەرپێ و دەستی بەشەڕ کردن کردن تا قەڵاکەیان بەجێهێشت و رایان کرد. ئەو بەتەنیایی دەستی بەسەر ئەو قەڵاداگرت. دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئەم کارەی لەشوشتەر کرد.

## ئاشتی جوندیشاپور

لەم ساڵەدا موسوڵمانان لەشوشەوە بەرێکەوتن ولەجوندیشاپور دابەزین. زێڕ کوڕی عەبداللە خەڵکی جوندیشاپوری گەمارۆدابو. موسوڵمانان ریزیان بەست و شەڕی ئەوانیان کرد. لەلایەن سوپای موسوڵمانانەوە ئەمان نامەیەك بۆ ئەوان هاوێژرا. موسوڵمانان نەکەوتبونە خۆ کەدرگاکانی شاریان بەکراوە بینی و ئەوان بازارەکانی خۆیان کردەوە و ئاسودە سەرقاڵی کارەکانیان بون و بەئارامی و ئاسایش هاتنەدەر. موسوڵمانان سەبارەت بەم کارە پرسیاریان لەوان کرد و وتیان: بۆ ئێمە ئەمان نامەتان هاویشت کەپێی رازی بوین و باج دەدەین. وتیان: ئەو کارەمان نەکردوە! موسوڵمانان گەڕان و بینیان کۆیلەیەك بەناوی (موکەنەف) کەنەژادی دەگەڕایەوە بۆ خەڵکی ئەم شارە، ئەم کارەی ئەنجام داوە. وتیان: کۆیلەیەك زیاتر نیە. خەڵکی شار وتیان: ئێمە کۆیلە و ئازاد ناناسین (لەناو ئێرانیەکان ئایینی کۆیلە بونی نیە)ئێمە بەباج رازی بوین و وتەی خۆمان نەگۆڕی. ئەگەر دەتانەوێت، پەیمانی خۆتان بشکێنن. ئەم هەواڵەیان بۆ

عومەر نوسی و ئەو ئەمانەکەی ئەوانی بەڕەوا زانی. موسوڵمانان ئەمانیان بەخەڵکی جوندیشاپوردا و لەدەوری شارەکەی ئەوان بڵاوەیان لێکرد.

## ڕەوانە بونی موسوڵمانان بەرەو کرمان و شارەکانیتر

دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٣٨/١٧ زایینی عومەر فەرمانی بەموسوڵماناندا لەقوڵایی خاکی ئێران پێشڕەوی بکەن. لەمبارەوە، ئامۆژگاریەکانی ئەحنەف بەکار برد. فەرمانی بەئەبو موسای ئەشعەریدا لەبەسرەوە بەرەو کۆتا شوێنی ئەماندانی بەسرە بڕوات و لەوێ بمێنێتەوە تا فەرمانی پێدەگات. ئاڵاکانیان بەفەرماندەیی دەستە شەڕکەرەکان ڕەوانە کرد: ئاڵای خوراسانی بەئەحنەف کوڕی قەیسدا، ئاڵای ئەردەشێر خەرەی لەگەڵ شاپور دایە دەستی موجاشع کوڕی مەسعودی سەلەمی، ئاڵای ئیستەخری دایە دەست عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاصی سەقەفی، ئاڵای فەسای لەگەڵ دارابگێرد بەساریە کوڕی زونەیمی کەنانیدا، ئاڵای کرمانی بەسوهەیل کوڕی عودەیدا، ئاڵای سیستانی بەعاصم کوڕی عەمرۆ (لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص)) و ئاڵای ئاوچەکانی مەکرانی بەحەکەم کوڕی عومەیری تەغلەبی. ئەوان هاتنەدەر بەڵام بواری بەرێکەوتنیان تا ساڵی ٦٣٩/١٨ زایینی نەڕەخسا.

عومەر چەند کەسێکی لەخەڵکی کوفە بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە کرد: عەبدالله کوڕی عیتبان بۆ هاوکاری سوهەیل کوڕی عودەی ڕەوانە کرد، عەلقەمە کوڕی نەزری و عەبدالله کوڕی ئەبی عەقیل و ڕێبعی کوڕی عامری بۆ هاوکاری ئەحنەف کوڕی قەیس و عەبدالله کوڕی عومەیری ئەشجەعی بۆ هاوکاری عاصم کوڕی عەمرۆ و شەهاب کوڕی مخارقی لەگەڵ چەندین دەستە لەخەڵکان بۆ هاوکاری حەکەم کوڕی عومەیر.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم ڕوداوانە لەساڵی ٦٤٢/٢١ زایینی یا ٦٤٣/٢٢ زایینی ڕویانداوە. هۆکاری دەست بەسەردا گرتنی ئەوان لێردا ئاماژەی پێدەدەین و بەخواستی خوا ئەو هۆکارانە دیاری دەکەین.

## ڕوداوەکانیتر

کارگوزارانی عومەر لەم ساڵانەدا ئەمانە بون: لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید (بەوتەی هەندێ کەس) لەیەمەن یەعلی کوڕی مونیە، لەبەحرەین و یەمامە عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص، لەعەممان حوزەیفە کوڕی مێحصەن، لەشام ئەوانەی پێشتر ئاماژەیان پێدرا، لەکوفە وسەرزەمینەکانی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص، لەسەردامەزراوەی دادی ئەوێ ئەبو قوڕە، لەبەسرە و سەرزەمینەکانی ئەبو موسا ئەشعەری، لەسەر دامەزراوەی داد ئەبو مەریەمی حەنەفی و لەموسڵ و جەزیرە ئەوانەی پێشتر ئاماژەیان پێدرا.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

## روداوەکانی ساڵی هەژدەیەمی کۆچی (٦٣٩ زایینی) وشکەساڵی ساڵی خۆڵەمێش

لەساڵی ٦٣٩/١٨ زایینی برسیەتی و بێ بارانی و وشکەساڵیەکی دژوار یەخەی خەڵکی گرت و ئەم ساڵەیان بە(ساڵی خۆڵەمێش) ناوبرد. لەم ساڵەدا با خۆڵێکی وەك خۆڵەمێش بڵاو دەکردەوە و لەبەر ئەوە بەساڵی خۆڵەمێش ناویان برد. برسیەتی بەرادەیەك تەنگی بەخەڵك هەڵچنی کەئاژەڵە کێوی و دەشتیەکان پەنایان بۆ خەڵك دەهێنا. هەندێ کات رویدەدا پیاوێك مەڕێکی سەردەبڕی کەبەرادەیەك لاواز و چڵکن بو، لەخواردنەکەی خۆی بەدور دەگرت. هەروەها لەم ساڵەدا تاعونی عەمواس لەناو خەڵکدا بڵاوبویەوە. نامەی ئەبوعوبەیدە بۆ عومەر گەیشت کەدەڵێت: دەستەیەك لەموسوڵمانان و لەناویان زێرار و ئەبوجەندەل شەرابیان خواردوە. ئێمە داوامان لەوان کرد و بۆ لای خوا گەڕانەوە وتیان: ئێمەیان ئازاد کردوە و ئێمە ئەوەی ویستمان هەڵمانبژارد (قورئان دەڵێت: ئایا دەوەستن؟) (مائدە٥/٩١). وتی: ئایا دەوەستن؟ بەڵام کارەکەی تەواو نەکرد. پێی وت: ئەوان لەبەرابەر خەڵك بانگ بکە و لێیان بپرسە ئایا خواردنەوە ڕەوایە یا ناڕەوا. ئەگەر وتیان ناڕەوایە، یەکی هەشتا قامچیان لێبدە و ئەگەر وتیان ڕەوایە، لەملیان بدە. ئەبوعوبەیدە لەوانی پرسی و ئەوان وتیان: ناڕەوایە. قامچی لێدان. ئەوان لەسەر پێداگری خۆیان پەشیمان بونەوە. وتی: ئەی خەڵکی شام، بێ گومان لەناو ئێوەدا کارەساتێکی گەورە رودەدات. ئەوە بو ساڵی خۆڵەمێش گەیشت. عومەر سوێندی خوارد هیچ گۆشت و شیر و رۆنێك نەچێژێت تا خەڵك گیان بگرن و نانیان دەست کەوێت. لەم کاتەدا مەشکەیەك پڕ رۆن و دەفرێکی پڕ شیر هاتە بازار. یەکێك لەکۆیلەکانی عومەر بەچل دردەم کڕی و بردیە لای عومەر وتی: ئەی سەرودری باوەڕداران، خوا کۆتایی بەسوێندەکەی تۆ هێناوە و بەشەکەی تۆی زیاد کردوە. مەشکەیەك رۆن و دەفرێك شیر هاتە بازار و من بەچل دردەم کڕیم. عومەر وتی: گرانت کڕیوە و کارێکی گرانت کردوە، لەرێگەی خوادا بیدە بەهەژارێك چونکە بەڕەوای نازانم گران بکرم و زێدە خەرجی

بکەم. دوبارە وتی: چۆن ڕێز لەکۆمەڵانی خەڵك بگرم ئەگەر گرفتاری ئەوان منیش گرفتار نەکات.

عومەر بۆ فەرمانداری شارەکان نامەی نوسی و لەوان بۆ هاوکاری کردنی خەڵکی مەدینە داوای هاوکاری کرد. یەکەم کەس هاتە لای ئەو، ئەبوعوبەیدەی جەڕاح بو کەچوار هەزار وشتر خواردەمەنی هێنا. عومەر فەرمانی پێدا لەناو خەڵکی دەوروبەری مەدینەدا بلاّوی بکاتەوە. ئەبوعوبەیدە دابەشی کرد وبۆ سەر کارەکەی خۆی گەڕایەوە. خەڵك بەردەوام دەهاتن و حەجازیەکان بێ نیاز بون. عەمرۆ کوڕی عاص کاری کەشتیرانی دەریایی سوری ڕێکخست و لەو ڕێگەوە خواردنی بۆ مەدینە نارد. بەهای خواردن لەمەدینە بوبەهاوتای خواردن لەمیسر. خەڵکانی مەدینە دوای ساڵی خۆڵەمێش ساڵێکی لەو شێوەیان نەبینی تا دوای کوژرانی عوسمان ڕێگەی دەریایی سور لەسەر ئەوان داخرا. لەم کاتەدا لاواز و ناتەوان بون. خەڵك لەئاوا ڕۆژگارێك دا دەژیان وعومەر وەك بلێی لەخەڵکی شارەکانیتر دابڕاوە.

لەم کاتەدا کەسانی یەکێك لەبنەماڵەکانی مەدینە بەخاوەنەکەی خۆیان بیلال کوڕی حارسیان وت: لەبرسیەتیدا فەوتاین، مەڕێکمان بۆ سەر ببڕە. وتی: مەڕەکان شتێکی شیاوی خواردنیان پێوە نیە. ئەوەندە پێداگریان کرد تا مەڕێکی سەربڕی و کاتێك پێستەکەی داماڵی، ئێسقانێکی سور دەرکەوت. هاواری کرد: ئەی محەممەد! پێغەمبەر(ص) ڕۆشتە خەوی وپێی وت:مژدە لێ بێت باران دەبارێت.

بڕۆ لای عومەر و لەمنەوە سلاّوی بگەیێنە و بلێ من تۆم لەهاوڕێیەتی بەهێز و لەسەر پەیمانەکەی خۆم لەبیرە، وشیار بەرەوە وشیار بەرەوە ئەی عومەر. ئەو ڕۆشتە ماڵی عومەر و بەکۆیلەکەی وت: بۆ نێردراوی نێردراوی خوا داوای مۆڵەت بکە. کۆیلە هات و هەواڵەکەی گەیاند. عومەر ترسا و وتی: ئایا هیچ بەڵگەیەت بۆ شێتی لەو پیاوەدا نەبینی؟ کۆیلە وتی: نە. پیاو ڕۆشتە ناو و خەوەکەی خۆی بۆ عومەر باس کرد. عومەر ڕۆشتەدەر و لەناو خەڵك قسەی کرد و لەسەر کورسی وتاردان دانیشت و وتی: ئێوە بەو خواییەی ڕێنوێنی کردن، سوێندتان دەدەم، ئایا کارێکی ناپەسندتان لەمن بینیوە؟ وتیان: نە. بەلاّم بۆ ئەم پرسیارە دەکەیت؟ ئەو هەواڵی خەوەکەی بۆ باس کردن و خەڵك لەنهێنیەکەی تێگەیشتن بەلاّم هێشتا عومەر نا. وتیان: لەنوێژی باران

کەمتەرخەمیت کرد، بۆ ئێمە نوێژی باران بخوێنە. ئە و لەناو خەڵکدا هاواری کرد و عەباس بەپێ لەگەڵیدا بەرێکەوت. عومەر وتارێکی کورتیدا و نوێژی خوێند، دواتر کەوتە سەرچۆك و وتی: ئەی خوایە، هاورێیانی ئێمە لەهاوکاری کردن ناتەوان بون، توانایی ئێمە کەم بویەوە،هێزەکانمان لاواز بو، گیانمان بێهێز و تاقەت و توانایی تەنیا لای تۆیە. ئەی خوایە، باران بۆ ئێمە ببارێنە و بەندەکان و شارەکان زیندو بکەرەوە! ئەو دەستی عەباس کوڕی عەبدولوتەلیب مامی پێغەمبەر(ص)ی گرت. فرمێسك لەچاوەکانی عەباس دەتکایە سەر ریشە سپیەکەی. عومەر وتی: ئەی خوایە، لەگەڵ مامی پێغەمبەکەردت کەسلاوی تۆی لێبێت، لەتۆ دەپارێینەوە. ئەو پاشماوەی چاکەکان و گەورەی پیاوانی پێغەمبەر(ص)ە. تۆ دەڵێیت و وتارەکەی تۆ راست و تەواوە: بەلاَم دیوار، هی ئەو دو کوڕە بێ باوکە لەشارەکەدا بو و لەژێریدا گەنجێك بۆ ئەوان. خواوەند ویستی ئەم دوانە گەورە بن و گەنجەکەیان دەربێنن (کهف١٨/٨٢) تۆ ئەم دومناڵەت لەبەر خواپەرەستی باوکیان پاراست، ئەی خوایە، ئابڕوی پێغەمبەر(ص)دکەت لەروخساری مامیدا بپارێزە چونکە ئێمە دەست بەداوێنی ئەو بوین و ئەومان کردە نێوەنجیگەری خۆمان و داوای لێخۆش بون لەتۆ دەکەین. دواتر روی کردە خەڵك و وتی: داوای لێبوردن لەخواکەتان بکەن چونکە زۆر مێهرەبانە.

تەمەنی عەباس درێژ ببویەوە و چاوەکانی لەخۆوە فرمێسکیان دەباراند و ریشی دەگەشتە سەر سنگی. بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە، تۆ شوانێکی ونبو بەخۆی مەسپێرە، شکاو لەم دنیا وێرانە بەتەنیا جێ مەهێڵە چونکە هاوار لەمناڵەکان بەرز بۆتەوە، گەورکان لاواز و لاغر بون و ئاوازی دادخوازی لەئەرزەوە گەشتۆتە ئاسمان. تۆ نهێنیەکان دەزانی و لەشاراوەکان ئاگاداریت. ئەی خوایە، پێش ئەوەی بێ هیوا و لەناو بچن، ئەوان بەسامانەکەی خۆت بەتوانا بکە. تەنیا ناباوەڕان لەخۆشەویستی خوا بێ ئومێد دەبن. لەم کاتەدا پەڵە هەورێك لەئاسمان دەرکەوت و خەڵك وتیان: دەبینن، دەبینن! دواتر هەورەکان هاتنە یەك و بایەك هەڵیکرد. هەورەکان ئارام بونەوە و تاڤگە ئاسا دەستیان بەباران کرد. خەڵك لەشوێنی خۆیان نەجولاَبون کەناچار بون پەنا بۆ بن دیوارەکان ببەن. خەڵك ڕۆشتنە لای عەباس و دەستیان لەئەندامەکانی جەستەی دەدا و دەیانوت: نۆشی گیانت بێت ئەی نۆشکەری دو بارەگایی خوایی! فەزڵ کوڕی عەباس

کوڕی عوتەبە کوڕی ئەبی لەهب لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| بعمی سقی الله الحجاز و اهله | عشیة یستسقی بشیبته عمر |
| توجه بالعباس فی الجدب | اله فما ان رام حتی اتی المطر |
| و منا رسول الله فینا تراثه | فهل فوق هذا للمفاخر مفتخر |

یانی:

لەبەر ئابروی مامی من بو خوا بارانی بۆ حجاز و خەڵکەکەی باراند و ئەمە لەو ئێوارێ بو کەعومەر لەریشی سپی ئەو بۆ دەرگای خواوەند ناوبژیوانێکی دروست کرد و داوای بارانی کرد. لەوشکەساڵیدا لەگەڵ عەباس لەگیان ودڵ روی لەخوا کرد و هێشتا هەڵنەستابو، باران باری. لەناو ئێمە تەنیا پێغەمبەر(ص)ە میراتەکەی لەناو ئێمەدایە. ئایا بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت شانازی بەخۆیەوە بکات، هۆکارێکی باشتر لەمە دەست دەکەوێت.

## تاعونی عەمواس

لەم ساڵەدا تاعونی عەمواس لەشام بلاوبویەوە. لەزیانەکەی ئەبوعوبەیدە کوڕی جەراح فەرماندەی سوپای موسوڵمانان (لەسوریە) مەعاز کوڕی جەبەل، یەزید کوڕی ئەبی سوفیان، حارس کوڕی هاشم، سوهەیل کوڕی عەمرۆ، عەتەبە کوڕی سوهەیل و عامر کوڕی غیلانی سەقەفی مردن و خەڵك لەناوچون.

تاریق کوڕی شەهاب دەڵێت: ڕۆشتمە لای ئەبو موسا ئەشعەری لەماڵەکەی لەکوفە و گفتوگۆمان دەست پێکرد. وتی: ئاگادار بن کارەکە بەسوك مەزانن چونکە لەم ماڵەدا کەسێك مردوە. هەروەها نابێت خۆتان لەم شارە بەپاکتر بزانن و روبکەنە پانتایی و سەرسەوزیەکانی ولاتەکەتان تا ئەم نەخۆشیە نەمێنێت. ئێستا ئاگادارتان دەکەمەوە دەبێت لەچ شتێك خۆتان بەدور بگرن و چ شتێك پەسەند نەکەن. هەرکەس بڕواتەدەر، گومان بکات ئەگەر دەمایەوە، دەمرد. بابەتێکیتر ئەوەی یەکێك کەبمێنێتەوە و نەخۆش بکەوێت و گومان بکات ئەگەر بڕوات، گرفتار نەدەبو. ئەگەر موسوڵمان ئەم گومانەی نەبێت، ئەرکی سەرشانیەتی نەڕواتەدەر. من لەساڵی تاعونی عەمواس لەشام هاوڕێی ئەبوعوبەیدە بوم. کاتێك نەخۆشیەکە بلاوبویەوە و هەواڵەکەی بەعومەر کوڕی خەتاب

گەیشت، نامەی بۆ ئەبوعوبەیدە نوسی تا لەگێژاوی ئەو نەخۆشیە رزگاریان بکات.

نوسی: سلاَو لەتۆ. من نیازێکم بەتۆهەیە وپێویست دەکات بەدەم پێت بڵێم. سوێندت دەدەم کاتێك نامەکەی من دەخوێنیتەوە، نەیخەیتە سەرزەوی تا بەرەو لای من بەرێکەویت. ئەبوعوبەیدە زانی عومەر داوای چی کردوە. وەلاَمی بۆ نوسیەوە: ئەی سەرودری باوەڕداران، لەنیازەکەی تۆ ئاگادار بومەوە. من لەناو سوپایەك لەموسوڵمانانم کەناتوانم لێیان دوربکەومەوە. خوازیاری دوری لەوان نیم تا خوا فەرمانەکەی سەبارەت بەمن و ئەوان ردوا بکات و ئەوەی مەبەستیەتی ئەنجامی بدات. من لەسوێندەکەی خۆت ببورە. کاتێك نامەکەی بەدەستی عومەر گەیشت، دەستی بەگریان کرد. وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا ئەبوعوبەیدە مردوە؟ وتی: نا بەلاَم نزیکە.

عومەر نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا دەبێت موسوڵمانان لەوشوێنە بۆ جێگەیەکی دیکە ببات. ئەو ئەبو موسای ئەشعەری بانگ کرد و وتی: بۆ موسوڵمانەکان شوێنێکی شیاو بدۆزەرەوە. دەڵێت: رۆشتمە ماڵەکەم تا هۆکارەکانی کۆچی موسوڵمانان ئامادە بکەم بەلاَم بینیم تاعون هاوسەرەکەمی کوشتوە. بۆ لای ئەبوعوبەیدە گەڕامەوە و وتم روداوێکم بۆ هاتۆتە پێش. ئەبوعوبەیدە وتی: ئەگەری هەیە هاوسەرەکەت تاعونی گرتبێت؟ وتم: بەڵێ. ئەبوعوبەیدە فەرمانیدا وشترەکان بخەنە سەرزەوی و ئامادەیان بکەن. هەرئەوەندی ویستی سوار بێت، تاعونی گرت. ئەبوعوبەیدە وتی: سوێند بەخوا گیرۆدەی نەخۆشیەکی مەترسیدار بوم. دواتر خەڵکی برد و لەجابیە دابەزی. ئەبوعوبەیدە لەناو خەڵك هەستا و بەوانی وت: ئەی خەڵکینە، ئەم نەخۆشیە، خۆشەویستیەك لەلایەن خواکەتان و بانگەوازێك لەلایەن پێغەمبەر(ص)ەکەتان و هۆکاری مەرگی چاکان لەپێش ئێوەیە. ئەبوعوبەیدە داوای لەخوا کردبو، بەشی خۆی لەم نەخۆشیە پێبدات. لەبەر ئەمە تاعونی گرت و مرد. ئەو مەعاز کوڕی جەبەلی کردە جێگری خۆی. مەعاز دوای ئەوەی لەناو خەڵکدا وتاریدا وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم ئازارە، خۆشەویستیەك لەلایەن خوا و بانگەوازی پێغەمبەر(ص) و هۆکاری مەرگی چاکانە. مەعاز داوا لەخوا دەکات بەشی ئەوان و بنەماڵەکەی لەم نەخۆشیە بەوان ببەخشێت. کوڕەکەی عەبدولرەحمان تاعونی گرت و مرد. دواتر هەستا و داوای نەخۆشیەکەی بۆ خۆی کرد. نەخۆشی کەوتە بەری دەستی و ئەو بەردەوام بەری دەستی

خۆی ماچ دەکرد. بەردەوام دەیوت: حەز ناکەم بەبونی تۆ، هیچ بەشێکم لەم دنیایە هەبێت، کاتێك ویستی لەم دنیا کۆچ بکات، عەمرۆ کوڕی ئەبی ئەلعاصی وەك جێگری خۆی دیاری کرد. عەمرۆ عاص خەڵکی بۆ کوێستانەکان برد و خوا نەخۆشیەکەی لەسەر هەڵگرتن و عومەر بۆ ئەم کارە ڕەخنەی لەعەمرۆ نەگرت.

دەستەیەك دەڵێن: عومەر کوڕی خەتاب بەرەو شام بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە سەرغ، فەرماندەی سوپاییەکان پێشوازیان لێکرد. ئەبوعوبەیدەی جەراح لەناو ئەواندا بو. ئەوان عومەریان لەنەخۆشیەکە و گرفتاریەکانی ئاگادار کردەوە. هاورێ لەگەڵ عومەر دەستەیەك لەموهاجیرەکان و ئەنسار بون. ئەو بۆشەڕ لەرێگای خوا هاتبو. موهاجیر و ئەنسارەکانی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد. ئەوان بۆچونەکانیان جیاواز بو. دەستەیەك وتیان: تۆ بۆ شەڕ لەرێگای خوا هاتویت و نابێت ئەم پێشهاتە تۆ لەکارەکەت دور بخاتەوە. دەستەیەکیتر وتیان: ، ئەمە، ئەزمون و نەخۆشیە، ئێمە پێمان باش نیە تۆ خۆت گرفتار بکەیت. بەوانی وت: هەستن. دواتر موهاجیرەکانی لەقوڕەیش کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد. ئەوان یەکدەست وتیان: دەبێت بگەڕێیتەوە. عومەر لەناو خەڵکدا وتی: من بەرەبەیانی بەیانی لەسەر پشتی وشتر دەبم. ئەبوعوبەیدە وتی: ئایا لەفەرمان و چارەنوسی خوا رادەکەیت؟ عومەر وتی: بەڵێ لەچارەنوسی خوا بۆ چارەنوسی خوا رادەکەم. بەڵێ، ئەگەر وشترەکانی خۆت بۆ دۆڵێك ببەیت کەنارەی هەبێت، یەکیان سەرسەوز و ئەویتریان وشك. ئایا ئەگەر وشترەکانت لەشوێنی پڕگیا بلەوەڕێنیت، بەفەرمانی خوا لەوەڕاندوتە و ئەگەر بیانبەیتە وشکایی چارەنوسی ئەوت هەڵبژاردوە؟ عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتارەکەی ئەوانی بیست و وتی: پێغەمبەر(ص) وتویەتی: ئەگەر بیستان لەشارێکدا نەخۆشی بڵاوبۆتەوە، رومەکەنە ئەو شارە. و ئەگەر لەسەرزەمینێکدا بن و ئەم نەخۆشیە لەوێ بڵاوبێتەوە، لەوێ مەڕۆن و رامەکەن. عومەر خەڵکی بۆ مەدینە گەڕاندەوە.

ئەم گێڕانەوەیە راستترە چونکە بوخاری و موسلیم لەکتێبەکانیان وەك حەدیسێکی راست ئاماژەیان پێداوە. بەڵگەیەکی دیکە بۆ راستیەکەی ئەوەیە کەئەبوموسا ئەشعەری لەم ساڵەدا لەبەسرە بو نەك لەشام. بەڵی، ئەو بەمشێوەیە بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە و ئێمە ئاماژەمان پێدا تا خوێنەرانی لێ ئاگادار بکەینەوە.

ئەوەی وتی بانگەوازی پێغەمبەر(ص)ەکەتانە بەو مانایە کەجبرەئیل هاتە لای و وتی: لەناوچونی ئومەتەکەی تۆ بەشەڕ بێت یا بەتاعون، وتی بەتاعون.

## روداوەکانیتر

کاتێك یەزید کوڕی ئەبی سوفیان مرد، عومەر براکەی معاویە کوڕی ئەبی سوفیانی کردە فەرمانڕەوای دەمشق و کۆکردنەوەی باج. شورەحبیل کوڕی حەسەنەی کردە فەرماندەی سوپای ئوردون و کۆکردنەوەی باجی بەساو بەخشی. خەڵك لەم نەخۆشیە بەئەندازەیەك زیان و مەرگیان بینی کەهاوشێوەیان نەبینیبو. کاتێك نەخۆشیەکە خایاندی، دوژمنانی موسوڵمانان چاوی تەماحیان تێبڕین. نەخۆشی چەندین مانگ بەردەوام بو. ئەم نەخۆشیە خەڵکی بەسرەیشی گرتەوە. ژومارەی ئەو کەسانەی بەتاعونی عەمواس مردن، بیست و پێنج هەزار کەس بو.

## هاتنی عومەر بۆشام دوای تاعون

کاتێك خەڵك لەزیانی تاعون مردن، فەرمانددەی سوپاکان نامەیان بۆ عومەر نوسی کە ئەوان ئەندازیەکی زۆر میراتیان لایە. عومەر خەڵکی کۆکردەوە و وتی: ئەم ئەندێشەیەم بۆ دروست بوە کە لەشارەکان سەردانی خەڵکان بکەم و لەنزیکەوە لەرۆژگار و کاروباری ئەوان ئاگادار ببمەوە. بۆچونی خۆتانم پێ بڵێن. لەناو ئەواندا کەعب الاحبار بو کەلەهەمان ساڵدا باوەڕی هێنابو. کەعب وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەتەوێت لەکوێوە دەست پێبکەیت؟ وتی: لەعێراق. کەعب وتی: ئەم کارە مەکە چونکە خراپە دەبەشە و نۆ بەشی لەرۆژهەڵاتە و یەك بەشی لەرۆژئاوا. عەلی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کوفە بۆ کۆچ کردن لەدوای کۆچ کردنە. ئەم شارە بارەگایی ئیسلامە. بێ گومان ئەم شارە رۆژێك وای لێدێت کەهەمو موسوڵمان ئارەزو دەکەن بڕۆنە ئەو شارە. خوا بەهاوکاری خەڵکی ئەم شارە بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێت بەهەمان شێوە کەبەهاوکاری بەردەکان خەڵکی لوتی لەناو برد. عومەر وتی: میراتەکانی خەڵکی عەمواس خەریکە لەناو دەچن، من لەشامەوە دەست پێدەکەم و میراتەکان لەناو ئەواندا دابەش دەکەم و ئەوەی لەدڵمدایە بۆ ئەوانی سەقامگیر دەکەم و دواتر دەگەڕێمەوە و

بەشارەکاندا دەسورێمەوە و فەرمانەکانی خۆم بەوان دەگەیێنم.

عومەر لەمەدینەوە بەرێکەوت و عەلی کوڕی ئەبی تالبی کردە جێگری خۆی لەمەدینە و رێگەی ئەیلەی گرتەبەر. کاتێك نزیك کەوتەوە، سوار وشترەکەی خۆی بو و لەسەر باروبنەکەی پێستەیەکی سەرەو خوار. چوارپێ سواریەکەی خۆی بەکۆیلەکەی دا. خەڵك پێشوازیان لێکرد و وتیان: سەروەری باوەڕداران لەکوێیە؟ عومەر وتی: روبەروی ئێوە، یانی منم. بەپێشوازیکەرانی وت: سەروەری باوەڕداران هاتۆتە ناو شار و لەوێ نیشتەجێیە. ئەوان بۆ لای ئەو گەڕانەوە. عومەر کراسەکەی خۆی بەمەلاکەی ئەوێدا کە لەپشتەوە دڕابو تا بۆی بشوات و پینەی بکات. ئەم کارەی بۆکرد عومەر گرتی و لەبەری کرد. مەلا کراسێکی دیکەی بۆ دوری بەلاَم وەری نەگرت. کاتێك گەیشتە شام، رۆژیەکانی دابەش کرد و خواردنەکانی زستانی و هاوینەی ناوبرد و پێگە سنوریەکانی بەهێز کرد و دەستی بەسوڕان لەو ناوچانە کرد. عەبداللە کوڕی قەیسی کردە فەرماندەی کەنار شارەکان و فەرمانداری بەمعاویە بەخشی و شورەحبیل کوڕی حەسەنەی لەسەر کار لابرد و لەناو خەڵك داوای لێبوردنی لێکرد و وتی: من شورەحبیلم لەبەر توڕەیی لەسەر کار لانەبرد بەڵکو پیاوێکی بەهێزترم خستە جێگەکەی. عەمرۆ کوڕی عەتەبەی کردە فەرمانڕەوای ئەهرا . میراتەکانی خەڵکی عەمواسی دابەش کرد کەلەم ناوەدا کەسانێك زنجیر ئاسا میراتیان بەرکەوت. عومەر دارایی و سامانەکانی بەزیندوەکانی هەر بنەماڵەیەك گەیاند. حارس کوڕی هشام لەگەڵ هەشتا کەس لەبنەماڵەکەی خۆی ڕۆشتەدەر کەجگە لەچوار کەسیان نەگەڕانەوە. عومەر لەمانگی زیقەعدە/نۆڤەمبەری٦٣٩ زایینی بۆ مەدینە گەڕایەوە.

ئەو کاتەی لەشام بو، کاتی نوێژ گەیشت، خەڵك پێیان وت: چەندە باش دەبێت ئەگەر فەرمان بەبیلال بدەیت تا بانگ بڵێت. ئەو فەرمانی بەبیلالدا و بانگی وت. هەمو ئەو کەسانەی رۆژگاری پێغەمبەر(ص)یان بینیبو، بەبیستنی دەنگی بیلال دەستیان بەگریان کرد بەئەندازەیەك گەریشیان تەڕبو و عومەر زیاتر لەهەمویان دەگریا. ئەوانەی پێغەمبەر(ص)یان نەبینیبو و تەنیا بیستبویان، بەبینینی گریانی ئەوان کەوتنە گریان.

## رووداوەکانیتر

واقدی دەڵێت: ڕەها حەڕان و ڕەقە لەم ساڵەدا لەسەر دەستی عەیاز کوڕی غەنەم دەستیان بەسەرداگیرا و عەین ئەلودردە (سەچاوەی گوڵ) کەهەمان ڕەئس عەینە (سەرچاوەیە) لەسەردەستی عومەیر کوڕی سەعد دەستی بەسەرداگیرا کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

لەم ساڵەدا لەزی حەجە/دێسامبەری ٦٣٩ زایینی عومەر پێگەی ئیبراهیمی هێنایە شوێنەکەی ئێستای. پێشتر بەماڵی خواوە لکابو.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر شەریح کوڕی حارسی کەندی لەسەر دامەزراوەی دادی کوفە دانا و کەعب کوڕی سوەری ئەزدی لەبەسرە. فەرمانداری شارەکان هەمان کەسانە بون کەپێشتر ئاماژەیان پێدرا.

ئاپینی حەجی لەگەڵ خەڵکدا بەرێودبرد.

## روداوەکانی ساڵی نۆزدەیەمی کۆچی(٦٤٠ زایینی)

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی جەلەولا و مەداین لەم ساڵەدا لەسەر دەستی سەعد ئەنجام درا. هەروەها دەست بەسەرداگرتنی جەزیرە. ئاماژەمان بەدەست بەسەرداگرتنی هەموی ئەم شارانە بەگێڕانەوە جیاوازەکان، دا.

دەستەیەك دەڵێن: دەست بەسەرداگرتنی قیساریە لەم ساڵەدا بو لەسەردەستی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان. دەستەیەك دەڵێن لەساڵی ٦٤١/٢٠ زایینی رویدا. لەساڵی ٦٣٧/١٦ زایینی ئاماژەمان پێدا.

هەروەها لەم ساڵەدا بورکانی لەیلا تەقیەوە. عومەر فەرموی خەڵك هاوکاری هەژار و نەدارەکان بکەن. خەڵك ئەم کارەیان کرد و بورکانەکە دامرکایەوە.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

فەرماندە و کارگوزرانی ئەو، کەسانێك بون کەپێشتر ئاماژەمان پێدان.

هەروەها لەم ساڵەدا صەفوان کوڕی موعەتەلی سولەمی مرد. دەستەیەك مردنی ئەو لەساڵی ٦٨٠/٦٠ زایینی لەکۆتایی خەلافەتی مەعاویە دەزانن. هەروەها لەم ساڵەدا ئوبەی کوڕی کەعب مرد. دەستەیەك مردنی ئەو دەگێڕنەوە بۆ ساڵی ٦٤١/٢٠ زایینی یا ٦٤٣/٢٢ زایینی یا ٦٥٣/٣٢ زایینی. و خوا زاناترە.

## روداوەکانی ساڵی بیستی کۆچی (٦٤١ زایینی) گرتنی میسر

دەستەیەك دەڵێن: بەپێی گێڕانەوەی دەستەیەك لەمێژوو نوسان، میسر لەم ساڵەدا لەسەر دەستی عەمرۆ کوڕی ئەلعاص دەستی بەسەرداگیرا. هەروەها ئەسکەندەریەیش لەم ساڵەدا. دەستەیەك دەڵێن: ئەسکەندەریە لەساڵی ٦٤٦/٢٥ زایینی دەستی بەسەرداگیرا. دەستەیەکی دیکە دەڵێن: میسر لەمانگی رەبیع الاول ساڵی ٢٦/دێسامبەری ٦٤٦ زایینی دەستی بەسەرداگیرا. بەڵێ، دەبێت دەست بەسەرداگرتنی میسر پێش ساڵی خۆڵەمێش بێت چونکە لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی ئەلعاص لەرێگەی دەریایی سوورەوە خواردنی بۆ مەدینە دەنارد. دەستەیەکی دیکە بەشێوەیتریان گێڕاوەتەوە و خوا زاناترە.

داستانی گرتنی میسر بەمشێوە بو کەعومەر کوڕی خەتاب شاری بەیت ئەلموقەدەسی گرت و چەند رۆژێك لەوێ مایەوە و عەمرۆ عاصی رەوانەی میسر کرد و زوبەیر کوڕی عەوامی بەدوای ئەودا رەوانە کرد. خەڵك دەروازەی (ئەلیونیان) گرت و لەوێوە بەرەو میسر بەرێکەوتن. لەوێ ئەبومریەم (جاسلیق، گەورەی قەشەکانی مەسیحی) میسر روبەرویان بویەوە و ئوسقوفێك هاورێیەتی دەکرد کەبۆ پاسەوانی کردن لەم وڵاتە رەوانەی کردبو. کاتێك عەمرۆ عاص روبەرویان بویەوە، بۆ شەڕ کردن ریزیان بەست. ئەو پەیامی بۆ ناردن لەشەڕ کردن پەلە مەکەن تا ئێمە ئاگاداری پێویست بدەین و لای خوا داوای لێخۆشبونمان کردبێت. دەبێت ئەبو مریەم و ئەبومریام بێنە لای من. ئەوان دەستیان لەشەڕ هەڵگرت. ئەبو مریەم و ئەبومریام رۆشتنە لای ئەو. ئەوپێشنیاری ئیسلام یا باجی پێکردن و ئاگاداری کردنەوە کەپێغەمبەر(ص) بۆ میسریەکان رایسپاردون بەچاکە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکرێت و ئەمە لەبەر رێزگرتن لەهاجەر دایکی ئیسماعیلە. وتیان: خزمایەتیەکی دورە کەتەنیا بەپێغەمبەر(ص)ەکان دەگات. ئەمانمان بدە تا بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە. عەمرۆ وتی: کەسێکی وەك من فریو ناخوات بەلأم سێ رۆژ مۆڵەتتان پێدەدەم تا لەچارەنوسی خۆتان بڕوانن. وتیان: زیادی کە. عەمرۆ رۆژێکی پێ زیاد کرد و ئەم دوانە بۆ لای مەقوقس گەڕانەوە. ئەرتەبون لەرازی بون بەپێشنیاری باوەڕ هێنانی عەمرۆ خۆی بەدور گرت و فەرمانی شەڕی لەگەڵ موسوڵمانان دەرکرد. ئەو بەمیسریەکانی وت: ئێمە بەئەندازەی خۆتان بۆ بەرگری

کردن هەوڵ دەدەین. موسوڵمانان نەکەوتبونە خۆ کەببینیان بەیات بەسوپایەك بۆ شەڕیان هاتوە. پێشوازیان لێکرد. ئەرتەبون و زۆر لەهاورێکانی ئەو کوژران و کەسانی دیکە هەلاتن. عەمرۆ و زوبەیر کوڕی عەوام رۆشتنە عەین شەمس کەهێزە شەڕکەرەکانی میسر لەوێ جێگیر کرابون. ئەو ئەبرەهە کوڕی سەباحی بۆ لای فەرما رەوانە کرد وعەوف کوڕی مالکی بۆ ئەسکەندەریە. ئەو لەم شارە دابەزی. دەڵێن: ئەسکەندەریە و فەرما دو برا بون. عەمرۆ لەعەین شەمس دابەزی. میسریەکان بەپاشاکەی خۆیان وت: لەگەڵ ئەم خەڵکە دەتوانی چی بکەیت کەسزار و خوسرەویان تێکشکاندوە و دەستیان بەسەر ولاتەکەی ئەواندا گرتوە! خۆت لەگەڵ ئەوان دەرگیر و ئێمەیش گرفتار مەکە. ئەمە لەچوارەم رۆژدابو. پاشا رازی نەبو و خەڵك بۆ شەڕی ئەوان ریزیان بەست و شەڕیان دەست پێکرد.

کاتێك موسوڵمانان لەعەین شەمس روبەروی مەقوقس بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد، لاوازیان لەخۆیان نیشاندا. عەمرۆ دوبارە ئەوانی هاندا و سەرکۆنەی کردن. پیاوێك لەیەمەن پێی وت: ئێمە لەئاسن نەئافرێنراوین. عەمرۆ وتی: بێدەنگ بەئەی سەگ! پیاوی یەمانی پێی وت: کەواتە تۆ فەرماندەی سەگەکانیت. عەمرۆ داوای لەهاورێکانی پێغەمبەر(ص) کرد و وەلامیان دایەوە. وتی: بۆ پێشەوە بڕۆن کەبەهاوکاری خوا بەسەر ئەواندا سەردەکەوین. ئەوان هێرشیان برد و ئەبو بوردە وئەبو بەرزە لەناو ئەواندا بون. خەڵك بەدوای ئەواندا بەرێکەوتن. خوا موسوڵمانانی سەرکەوتو کرد و بتپەرستەکان شکەستیان خوارد. زوبەیر کوڕی عەوام رۆشتە سەر دیواری شارەکە. کاتێك ئەویان بینی، دەروازەیان بۆ عەمرۆ کردەوە و بەدەم داوای ئاشتیەوە بەرەوپیری چون. ئەو بەپێشنیاری ئاشتی ئەوان رازی بو. زوبەیر بەزۆر خۆی گەیاند تا لەگەڵ عەمرۆ رۆشتە ناو. دوای ئەوەی کەوتنە لێواری هەڵدێری لەناوچون، پەیمانی ئاشتیان بەست. ئەوەی بەزۆر دەستیان بەسەر گرتبو، وەك ئەو شوێنانەی بەئاشتی دەستیان بەسەرداگیرا، لەقەڵەم دران و خەڵکەکەی ئەمانیان پێبەخشرا. هەروەها پەیمانەکە ئەو کەسانەی لەرۆم و ئەدبە گرتەوە کەپەیوەستی ئەوان بون. هەرکەس کۆچ کردنی هەڵبژارد، ئەمانیاندا تا بڕواتە ئەو شوێنەی دڵخوازیەتی.

سوارانی موسوڵمان لەمیسر کۆبونەوە و بناغەی شاری فستاتیان دارشت و لەوێ دابەزین.

ئەبومریەم و ئەبومریام ڕۆشتنە لای عەمرۆ و داوای ئازاد کردنی ئەو ئەسیرانەیان کرد کەدوای شەڕەکە گیرابون. عەمرۆ ئەم دوانەی لەخۆی دورخستەوە. ئەم دوانە وتیان: هەرچی کە لەکاتی جیابونەوەی ئێمە لەئێوە تا گەڕانەوەمان بۆ لای ئێوە. گرتوتانە. ئەمانی پێ بەخشراوە. عەمرۆ وتی: ئایا هێرشمان دەکەنە سەر و دواتر خۆتان بەئەمان بەخشراو لەقەڵەم دەدەن؟ وتیان: بەڵێ. عەمرۆ عاص ئەسیرەکانی لەناو خەڵکدا دابەش کرد و ئەوان لەشارە عەرەبیەکان بڵاوبونەوە. ئەو پێنج یەکی هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەکی نوێنەرایەتی بۆ لای عومەر ڕەوانە کرد. نوێنەرەکان عومەریان لەهەمو هەواڵەکان ئاگادار کردەوە و وتارەکەی ئەبومریەمیان پێ وت. عومەر ئەو ئەسیرانەی کەلەو چوار ڕۆژەدا شەڕیان نەکردبو، ئازادی کرد و ئەو ئەسیرانەی شەڕیان کردبو، ئازادی نەکردن. سوپای موسوڵمانان ئەسیرانی یەکەمیان ئازاد کرد.

قبتیەکان ڕۆشتنە لای عەمرۆ. عەمرۆیان ئاگادار کردەوە کەقبتیەکان بەردەوام دەڵێن: عەرەبەکان چەندە پەرێشان و سوکن! هەرگیز نەبینراوە وەك ئێمە کەسێك بەم ئاسانیە دەستەمۆ و ملکەچیان بوبێت. ترسا ئەوان چاوی تەماحیان تێ ببڕن. فەرمانیدا کەچەندین مەڕیان سەربڕی و کوڵانیان. دواتر فەرمانەدکانی سوپای بانگ کرد و ئەوان هاوڕێیانی خۆیان کۆکردەوە کەلای ئەو هاوشێوەی عەرەبەکان خواردنیان خوارد و خواردیانەوە و پلە گۆشتەکانیان ئەجواو قوتدا. عەرەبەکان عابایان لەبەردابو و کەل وپەلی شمشێریان هەڵنەگرتبو. میسریەکان بوێرتر بون. ئەو فەرمانی بەموسوڵمانانەدا بەیانی بەپێلاو و جلی میسریەکان بێن. موسوڵمانان ئەو کاردیان کرد. فەرمانی بەمیسریەکان دا بێن و سەیری ئەوان بکەن. ئەوان شتێکی پێچەوانەی دوێنێیان بینی. نۆکەرەکان لەسەر سەریان وەستان و شلە ڕەنگاوڕەنگەکانیان هێنا و موسوڵمانەکان هاوشێوەی میسرەکان خواردنیان خوارد. ئەندێشە لای میسریەکان دروست بو. هەروەها پەیامی بەموسوڵماناندا: بەیانی کەل و پەلی شەڕ ببەستن و لەبەرابەر من تێپەڕکەن. فەرمانی بەمیسریەکاندا بێن و بڕوانن. ئەو سوپای ئیسلامی لەبەرچاوی ئەواندا تێپەڕاند و بەمیسریەکانی وت: هەستم بەبیرۆکە وئەندێشەی ئێوە سەبارەت بەعەرەبەکان لەکاتی کۆنەپۆشین کرد و ترسام خۆتان لەناو بەرن. حەزم دەکرد بەئێوەی بسەلمێنم ئەوان لەسەرزەمینەکانی خۆیان چۆن بون و ئێستا لەسەرزەمینی

ئێوە چۆنن. ئێوە بینیتان ئەوان بەسەر ئێوەدا زاڵبون و ژیانیان ئەوەبو کەبینیتان. دواتر بەوەی لەدوەم ڕۆژدا بەدەستیان هێنا، بەسەر هەمو وڵاتەکەی ئێوەدا زاڵبون. ویستم یاسای ڕۆژی سێیەم بزانن کەژیانی ڕۆژی دوەم پشت گوێ ناخەن و بۆ ژیانی ڕۆژی یەکەم ناگەڕێنەوە.

میسریەکان بڵاوەیان لێکرد و بەردەوام وتیان: عەرەبەکان پیادەکانی خۆیان بۆ لای ئێوە ڕەوانە کرد (یا تەنیا پیاوەکانیان ڕەوانە کرد). هەواڵی ئەم شەڕە بەعومەر گەیشت و وتی: سوێند بەخو شەڕی میسر نەرم و ئارام بو و دژواری و ڕەنجی شەڕەکانی دیکەی پێوەدیار نەبو.

دواتر عەمرۆ کوڕی عاص بەرەو ئەسکەندەریە ڕۆیشت و ئاهەنگی ئەو کەسانەی لەرۆمیەکان و قبتیەکان کرد کەلەفستات و ئەسکەندەریە بون. ڕوبەروی یەك بونەوە و شکەستی دان و بەسەختی کوشتاری کردن.

دواتر بەرێکەوت تا گەشتە ئەسەکەندەریە و بینی خەڵکەکەی بۆ شەڕ ئامادەن. مەقوقس نێردراوی بۆ لای عەمرۆ نارد و بۆماوەیەك داوای ئاگربڕی کرد. عەمرۆ ڕازی نەبو و وتی: ڕوبەروی شای شاکانی ئێوە هراکلیوس بوینەوە و بەڵایەکمان بەسەر هێنا کەبیستوتانە. مەقوقس بەهاورێکانی خۆی وت: ڕاست دەکات وئێمە بۆ فەرمانبرداری ئەو شیاوترین. میسریەکان بەتوندی قسەیان لەگەڵ کرد و لەقەڵاکاندا خۆیان حەشاردا. موسوڵمانەکان ڕوبەرویان بونەوە و بۆ سێ مانگ ئەوانیان گەمارۆدا. عەمرۆ بەزۆر دەستی بەسەرداگرت و ئەوەی لەوێ بو، وەك تاڵانی هەڵیگرت و ئەمانی بەخەڵکەکەی بەخشی.

دەستەیەك دەڵێن: مەقوقس لەسەر بنەمای دانی دوانزە هەزار دینار لەگەڵ عەمرۆ پەیمانی ئاشتی بەست لەسەر ئەو بنەمای هەر کەس نەخوازێت، لەئەسکەندەریە بڕوات و هەرکەس بیەوێت لەم شارەدا بمێنێتەوە. عەمرۆ لەم شارەدا سوپایەکی جێگیر کرد.

کاتێك میسر دەستی بەسەرداگیرا، بەرەو ئەوبە ڕۆیشت. موسوڵمانان بریندار و چاوتەقیو گەڕانەوە چونکە خەڵکانی نۆبە تیرهاوێژانی بەتوانا بون و لەبەر ئەوە ئەوانیان بە(ڕاوکەرانی چاو) ناوبرد.

کاتێك لەرۆژگاری عوسمان، عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح بوبەفەرمانڕەوای

میسر، لەگەڵ خەڵکانی نەوبە لەسەر بنەمای دانی دیاری سەرانەی ساڵانە پەیمانی ئاشتی بەست و بەڵێنی دا موسوڵمانان ساڵانە خواردەمەنی و جل وبەرگی دیاریکراو بەخەڵکانی نەوبە ببەخشن. عوسمان و فەرمانڕەوا ئیسلامیەکانی دیکە ڕێزیان لەم پەیمانە گرت.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك موسوڵمانان گەیشتنە بلهیب و نەسیرەکان گەشتبونە یەمەن. خاوەن نەسیرەکان پەیامی بۆ عەمرۆ نارد کە: من باجم بەکەسانێکدا دەدا کەپێش ئێوە بەدوژمنم دەزانین: ئێرانیەکان ورۆمیەکان. ئەگەر خوازیارن. باج وەربگرن لەسەر ئەو بنەمایی هەرچی ئەسیر لەم ولاتە گرتوتانە. ئازادی بکەن. ئەو نامەی بۆ عومەر نوسی و لەم بارەوە داوای فەرمانی کرد. موسوڵمانان دەستیان لەشەڕ هەڵگرت تانامەی عومەر گەیشت. لەعومەرەوە وەڵام هات کە: سوێند بەگیانی خۆم باجێکی هەمیشەیی باشترە لەتاڵانی کە لەلایەك بەدەستی بێنن و لەلایەکی دیکە بیبەخشنەوە وەك بڵێی خۆی لەسەرەتادا بونی نەبوبێت. سەبارەت بەنەسیرەکان ئەم کارە بکە: پاشای ئەوان باج بەتۆ بدات لەسەر ئەو بنەمایی نەسیرەکانی سەرپشك بکات تا هەرکەس ویستی باوەڕ بەئیسلام بێنێت و لەریزی موسوڵمانان هەژمار بکرێت و هەر کەس نەیویست لەریزی باجدەران حسێبی بۆ بکرێت. بەلأم ئەوانەی لەشارەکاندا بلأوبونەتەوە ناتوانین بیانگەڕێنینەوە. عەمرۆ ئەم پێشنیارەی بەفەرمانداری ئەسکەندەریەدا و پێی رازی بو. ئەسیرەکانیان کۆکردەوە و قەشەکانیان دانیشاند و ئەوانیان یەك یەك سەرپشك دەکرد. هەر کەس موسوڵمان دەبو بۆ بەختەوەری ئەو تەکبیریان دەوت و هەرکەس ئایینی مەسیحی هەڵدەبژارد، مۆڕەیان لێدەکرد و باجیان بەسەردا دەسەپاند. لەسەر ئەم کارە بەردەوام بون تا تەواو بون.

لەدیلەکان یەکێیان ئەبو مریەم عەبداللە کوڕی عەبدولرەحمان بو کەئیسلامی هەڵبژارد و بو بەسەرپەرەستی زەبید. پاشاکانی بەنی ئومەییە دەیانوت: میسر بەزۆر دەستی بەسەرداگیرا و خەڵکەکەی کۆیلەی ئێمەن کەهەرچەند بمانەوێت باری ئەوان زیاد دەکەین. درۆیان دەکرد کەئەم شتە لەئارادا نەبو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێکیتر

لەم ساڵەدا یانی ساڵی ٦٤١/٢٠ زایینی ئەبو بەحریە عەبداللە کوڕی قەیس ئاهەنگی شەڕی لەسەرزەمینی ڕۆم کرد. وتویانە ئەو یەکەم کەس بو ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ئەوان. دەستەیەك دەڵێن: یەکەم کەس مەیسەرە کوڕی مەسروقی عەبەسی بو. ئەو ئەسیر و تالانی گرت و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا عومەر قودامە کوڕی مەزعونی لەفەرمانداری بەحرەین لابرد و لەسەر ئەوەی شەرابی خواردبو، قامچی لێیدا و ئەبوبەکرەی لەبەحرەین و یەمامە دانا.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ فاتیمە کچی وەلید و دایکی عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هشام پەیوەندی هاوسەری بەست.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر سەعدی کوڕی وەقاصی لەفەرمانداری کوفە لابرد چونکە خەڵك وتیان نوێژەکانی خۆی بەجێ ناهێنێت.

لەم ساڵەدا عومەر خەیبەری لەناو موسوڵمانان دابەش کرد و جولەکەکانی لەوێ کۆچ پێکرد و وادی ئەلقورای دابەش کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا جولەکەکانی نەجرانی بۆ کوفە کۆچ پێکرد.

لەم ساڵەدا عومەر عەلقەمەی کوڕی موجەزەری مودلێجی ڕەوانەی حەبەشە کرد چونکە حەبەشیەکان هێرشیان کردبو سەر سنورەکانی موسوڵمانان و ئازاریان دابون.

عومەر لەگەڵ خۆی پەیمانی بەست هیچ موسوڵمانێك بۆ شەڕی دەریایی ڕەوانە نەکات.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم ڕوداوە لەساڵی ٦٥١/٢١ ڕویداوە.

هەروەها لەم ساڵەدا ئوسیەد کوڕی حوزەیر مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا هراکلیوس و کوڕەکەی کۆنستانین مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا زێنەب کچی جەحش چاوی لەجیهانی بەست. ئوسامە کوڕی زەید و کوڕی براکەی محەممەد کوڕی عەبداللە کوڕی جەحش ڕۆشتنە ناو ئارامگای ئەم ژنە.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. کارگوزارانی لەشارەکان ئەوانەبون کەپێشتر ئاماژەمان پێدا جگە لەوانەی وتمان عومەر لەسەر کار لایبردن. داوەرەکانی هەمان داوەرەکانی ساڵی پێشو بون.

لەم ساڵەدا عەیاز کوڕی غەنەم مرد. عەیاز ئەو کەسە بو دەستی بەسەر جەزیرەدا گرت. ئەو یەکەم کەس بو لەدەروازەی ڕۆم تێپەڕی کرد و ڕۆشتە ناوی.

لەم ساڵەدا بیلال کوڕی ڕەباح جاووشی پێغەمبەر(ص) لەدەمشق مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەحەلەب مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئونەیس کوڕی مورسد کوڕی ئەبی مورسدی غەنەوی مرد. ئەو و باوك و باوەگەوریی لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) هەژمار دەکران. باوکی لەشەڕی ڕەجیع کوژرا.

هەروەها لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عامر کوڕی حزیەمی جومەحی مرد. ئەو لەشەڕی خەیبەر بەشداری کرد. پیاوێکی زانا بو و تا کاتی مردن، فەرمانڕەوایی حمصی لەدەستا بو. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٩/ ٦٤٠ زایینیماڵئاوایی لەژیان کرد. دەستەیەك ئاماژەیان بەساڵی ٢١/ ٦٤٢ زایینی داوە. ئەو چل ساڵ ژیا.

هەروەها لەم ساڵەد ئەبو سوفیان کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب چاوی لەجیهان بەست.

هەروەها لەم ساڵەدا صەفیە کچی عەبدولموتەلیب و پوری پێغەمبەر(ص) ماڵئاوایی لەژیان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا موزەهەر کوڕی ڕافعی ئەنساری کوژرا. لەشامەوە لەگەڵ چەند پاڵەوانێك دەهات و کاتێك گەیشتە خەیبەر، جولەکەکان فەرمانیاندا و کوشتیان و عومەر جولەکەکانی لەدورگەی عەرەبی دەرپەڕاند.

## روداوەکانی ساڵی بیست و یەکەمی کۆچی(٦٤٢ زایینی)

### شەڕی نەهاوەند

دەستەیەك لەم ساڵەدا ئاماژەیان بەشەڕی نەهاوەند داوە و دەستەیەك لەساڵی ٦٣٩/١٨ یا ساڵی ٦٤٠/١٩ زایینی.

هۆکاری شەڕی نەهاوەند ئەوە بو کەموسوڵمانان سوپاکەی عەلا کوڕی حەزرەمیان لەدەست ئێرانیەکان رزگار کرد و دەستیان بەسەر ئەهوازدا گرت. ئێرانیەکان دەستیان بەنامە نوسین بۆ پاشاکەیان کرد کە لەمەرو ژیانی بەسەر دەبرد. شای شاکانی ئێران نامەی بۆ شاکانی ژێردەستی خۆی لەنێوان باب و سند و خوراسان و حیلوان نوسی و ئەوان هەمویان لەنەهاوەند کۆبونەوە. کاتێك یەکەم دەستە شەڕکەرەکانی ئەوان گەیشتن، ئەم هەواڵە بەسەعد کوڕی وەقاص گەیشت. ئەو بارودۆخەکەی بۆ عومەر نوسی. لەم کاتەدا دەستەیەك کەوتنە گیانی سەعد و رەخنەیان لێگرت و خەڵکیان دژی ئەو هاندا.

لەناو ئەو کەسانەی دژی ئەو هەوڵیان دەدا، جەراح کوڕی سەنانی ئەسەدی لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە دەبینران. عومەر بەوانی وت: سوێند بەخوا ئەوەی بەسەر ئێوەدا هاتوە، رێگر نابێت لەوەی لێکۆڵینەوە لەکارەکانی ئێوە بکەم. ئەو محەممەد کوڕی موسلیمەی لەگەڵ چەند کەسێك رەوانە کرد تا بۆ خۆراگری دژی ئێرانیەکان ئامادە بن. محەممەد سەرپەرەستی کارگوزاران بو و لێکۆڵینەوەی لەسەر وتار و کرداری ئەو کەسانە کرد کەدژی سەعد دەیانکرد و دەیانوت. ئەو سەعدی بەکوفەدا سوڕاند و بەردەوام سەبارەت بەو پرسیاری دەکرد.

لەهیچ دەستەیەکی نەپرسی، مەگەر ئەوەی وەسفیان کرد و بەباشی ناویان برد و ئەمانە جیاواز لەو کەسانە بون کەجەراح کوڕی سەنانی ئەسەدی ئەوانی هاندابو. ئەوان بێدەنگیان هەڵبژارد و زمانیان بەخراپی نەکردەوە چونکە لەبنەڕەتدا بۆ ئەوان رەوا نەبو. سەرئەنجام گەیشتە لای بەنی عەبس و لەوان پرسیاری کرد. ئوسامە کوڕی قیتادە وتی: ئەی خوایە، ئەو بەرابەر دابەش ناکات و لەداوەری دادوەری ناگرێتەبەر و ناڕواتە

گۆڕپانی شەڕ. سەعد وتی: ئەی خوایە، ئەگەر ئەم قسەیە لەروی خۆنواندن و درۆ و خۆپەسەندی دەکات، چاوەکانی کوێر و نانخۆرەکانی زیاد بکە و گرفتاری ئەزمونە گومڕاکەرەکانی بکە. لەزیانی ئەم دۆعایە چاوەکانی کوێر بو، دەکچ بۆ ئەو هاتنەدنیا و بارودۆخەی گەیشتە شوێنێك، کاتێك دەنگی ژنێکی دەبیست، بەدوایدا دەگەڕا و کاتێك لای ئەو تێدەپەڕی دەیوت: ئەمە لەبەر ئەوەیە کەسەعد، ئەو پیاوە پیرۆزە، دۆعای لەمن کرد. دواتر سەعد لەخوا بۆ ئەو چەند کەسە پاڕایەوە و وتی: ئەی خوایە، ئەگەر بەمەبەستی خۆنواندن و گەردن درێژی و رابواردن، هاتنەدەر، سەرزەمینەکەیان گرفتاری دژواری و بەدبەختی بکە. جەراح بارودۆخی گەیشتە شوێنێك کەلەرۆژی روبەرو بونەوەی حەسن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ معاویە کوڕی ئەبوسوفیان لەساباط، هێرشی کردەسەر، کەلەناکاو کوشتی و خەڵك بەشمشێر لەت و پەتایان کرد. سەروملی قەبیسە بەبەرد پان کرایەوە وئەربەد بەرادەیەك رِم و قنە شمشێری بەرکەوت، کەمرد.

سەعد وتی: من یەکەم کەس بوم خوێنی بتپەرستەکانم رژاند. لەبەر ئەمە پێغەمبەر(ص)ی خوا، بۆ وەسف کردنی من پێکەوە ناوی دایك و باوکی هێنا (دایك و باوکم بەقوربانی تۆبن کەچەند باش لەرێگەی ئیسلام شەڕ دەکەیت). من ئەو رۆژەم بیرە کەیەك لەسەر پێنجی ئیسلام بوم و ئێستا بەنی ئەسەد گومان دەکەم بەباشی نوێژەکانم ناخوێنم و بەردەوام سەرقاڵی راو کردنم.

محەممەد سەعدی لەگەڵ ئەوان هەڵگرت و بۆ مەدینەی بردن و هەمویان رۆشتنە لای عومەر و هەواڵەکانیان پێ راگەیاند. عومەر پرسی: ئەی سەعد، چۆن نوێژ دەخوێنیت؟ سەعد وتی: دو رەکعەتی یەکەم درێژ دەکەمەوە و دورکەعەتی کۆتایی کورت. عومەر وتی: ئەی ئەبو ئیسحاق، ئەم گومانەیش لەتۆدەکرا و ئەگەر دورئەندێشی نەدەبو، چاردنوسی ئەوان رون دەبویەوە. دوبارە وتی: ئەی سەعد، جێگری تۆ لەکوفە کێیە؟ سەعد وتی: عەبداللە کوڕی عێتبان. عومەر ئەوی لەسەر کارەکەی هێشتەوە. ئەم کارانە لەسەر یەك بونە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی نەهاوەند کە لەسەردەمی فەرماندیی سەعد ئاگرەکەی بڵێسەی سەند.

بەلاّم خودی شەڕەکە لەسەردەمی فەرماندیی عەبداللە رویدا. لەم کاتەدا ئێرانیەکان،

بەنامەکانی شای شاکان یەزدگێرد رویان لەهەر ناوچەیەك کرد و لەنەهاوەند لەژێر فەرمانی فیروزان کۆبونەوە. ژمارەی ئەوان سەد و پەنجا هەزار پیاوی شەڕکەر بو. سەعد ئەم هەواڵەی بۆ عومەر نوسیبو و کاتێك گەیشتە لای عومەر، ئەم هەواڵەی دوبارە هێنایە سەر زمان و وتی: خەڵکی کوفە چاوەڕوانی فەرمانی تۆن تا بڕۆنە قوڵایی وڵاتی ئێران و شەڕێکی قورس دەستپێبکەن تا لەبەرابەر دوژمنی بەشکۆتر و مەترسیدارتر خۆنیشان بدەن.

عومەر خەڵکی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد و پێی وتن: ئەمڕۆ رۆژێکە کەبەیانیەکی لەپێشە. دەمویست لەگەڵ کەسانی دەوروبەری خۆم و لەگەڵ ئەو کەسانەی وەڵامی بانگێشتەکەم دەدەنەوە، بەرێکەوم و لەشوێنێك لەنێوان ئەم دوشارە دابەزم و دواتر ئەوان رەوانەی شەڕ بکەم و خۆم ببمە پشتیوان تا خوا سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت و ئەوەی شیاوی فەرماندانە، بفەرمێت. ئەگەر خوا ئەوان سەرکەوتوو بکات، هەمویان لەسەرزەمینەکانی ئەوانم بڵاو دەکەمەوە.

تەڵحە کوڕی عەبداللە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کارەکان تۆیان فرەزان کردوە و گرفتاریەکان تۆیان بەئەزمون و ئەزمونەکان تۆیان رازاندۆتەوە. تۆ کارەکانی خۆت ئەنجام بدە و ئێمە شوێنت دەکەوین و هیلاك نابین. کارەکان لەدەستی تۆدایە. فەرمان بدە، تا فەرمان بەرین، بانگمان بکە تا وەڵام بدەینەوە، دەستور بدە تا سواربین و رێمان نیشاندە تاشوێنت کەوین چونکە تۆ خاوەندی ئەم کارەیت و هەمو کاروبارەکانت هەڵسەنگاندوە و ئەزمونت کردوە. لەئەنجامی فەرمانە خواییەکان تەنیا باشترینەکانی بەتۆبڕاوە. تەڵحە ئەمەی وت و دانیشت.

عومەر دوبارە وتارەکەی خۆی هێنایە سەرزمان. عوسمان هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچونم وایە نامە بۆ شامیەکان بنوسیت تا لەشامەوە بێن و بۆ یەمەنیەکان تا لەیەمەنەوە بەرێکەون و دواتر خۆت لەگەڵ خەڵکانی هەر دو بارەگایی خوایی بەرەو کوفە و بەسرە بەرێکەویت و لەبەرابەر فراوانی سوپای ئێرانیەکان، بەهێزێکی سەراسەری موسوڵمانان ریز ببەستیت چونکە کاتێك تۆ رەوانە بیت، ئەوەی لەسوپای دوژمن فراوان و زۆر بەرچاو دەکەوێت، لەبەرچاوی تۆدا کەم و کەمبایی بەرچاو دەکەوێت و تۆ بەرێزتر و بەهێزتر و فراوانتر دەبیت. ئەی سەروەری باوەڕداران تۆ

لەدوای خۆت کەس لەعەرەبەکان بەجێ ناهێڵێت و لەپیاوێکی بەرێز کەڵك وەرناگریت و لەپشتیوانێکی بەهێز بەهرە نابەیت. ئەمرۆ رۆژێکە بەیانیەکی بەدواوەیە. تیایدا بەبۆچونێکی بەهێز و ژوماردیەکی زۆر ئامادە بە و چاوی لێ هەڵمەگرە. عوسمان ئەمەی وت و دانیشت.

عومەر دوبارە قسەکەی دوبارە کردەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەستا و وتی: ئەی سەرەوەری باوەڕداران. ئەگەر تۆ خەڵکانی شام بۆ ئێرە بێنیت. رۆمیەکان ئاهەنگی بنەماڵەکانی ئەوان دەکەن و ئەگەر یەمانیەکان بۆ گۆڕەپانی شەڕ ببەیت. حەبەشیەکان هێرش دەکەنە سەر پاشماوەکانی ئەوان. ئەگەر تۆ لەم سەرزەمینە کۆچ بکەیت عەرەبەکان لەهەر لایەکەوە روودەکەنەوە پایتەختەتی فەرمانڕەوایی تۆ و پەیمانی خۆیان لەگەڵ تۆ دەشکێنن و ئەوەی لێرە بەجێی دێڵێت، لەمناڵ و ژنەکان. بارێکی قورستر دەخەنە سەرشانی تۆ. ئەوان لەشوێنەکانی خۆیان جێگیر بکە و فەرمان بۆ خەڵکی بەسرە بنوسە ببنە سێ دەستە: دەستەیەك پارێزگاری لەماڵ و بنەماڵەکانی خۆیان بکەن، دەستەیەك پارێزگاری لەژێردەستەکان بکەن تا پەیمانەکەی خۆیان نەشکێنن و دەستەیەك بۆ هاوکاری براکانیان لەکوفە رەوانە بکە. ئەگەر ئێرانیەکان بەیانی تۆ لەناو خۆیاندا ببینن. دەڵێن: ئەمە سەرەوەری باوەڕداران و سەرمایەی عەرەبەکانە. دواتر زیاتر بوێر دەبەن. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەرەوانە بونی ئێرانیەکان ئاماژەت پێدا، دەبێت بزانیت خوا پێش لەبەرێکەوتنی تۆ ئەوان بەدوژمنی خۆی دەزانێت و بۆ لەناوبردنی ئەوەی پەسەندی ناکات، بەتواناترە. و سەبارەت بەزۆری ئەوان، دەبێت ئاگادار بیت ئێمە لەرابردودا بەهێزی زۆرەوە شەڕمان نەدەکرد بەڵکو بەهاوکاری خواوەند.

عومەر وتی: بۆچونی راست ئەمەیە. بەردەوام دەمویست ئەم ئامۆژگاریە ببیستم و بەکاری ببەم. ئێستا پیاوێك بەمن نیشان بدەن فەماندەیی ئەم کاردی پێ بسپێرم.

دەستەیەك دەڵێن عوسمان و تەڵحە وەتیان، لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە و خوا زاناترە.

کاتێك عومەر وتی پیاوێك بەمن بناسێنن کەعێراقی بێت تا فەرماندەیی ئەو ناوچەی پێ بسپێرم، وتیان: تۆ لەسوپاکەی خۆت ئاگادارتریت چونکە هەمویان هاتنە لای تۆ.

عومەر وتی: سوێند بەخوا فەرماندەیی ئەوان بەکەسێك دەسپێرم کەکاتێك بەیانی بۆ گۆڕەپانی شەڕ دەروات یەکەم ڕم لەسینەی دوژمن بدات. وتیان: ئەو کێیە؟ وتی: نوعمان کوڕی موقەرەنی مەزنی. وتیان: پیاوێکی شیاوە.

نوعمان لەم کاتەدا هاورێ لەگەڵ سوپایەك لەکوفە بەسەری دەبرد کەهێرشیان کردبوە سەر جوندیشاپور و شوش. عومەر نامەی بۆ نوسی تا بەرەو ماە بڕوات تا سوپاییەکان لەدەوری کۆببنەوە. کاتێك لەدەوری ئەو کۆبونەوە، بڕواتە شەڕی فیروزان و هاورێکانی. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو نوعمان لەکەسکەر بەسەری دەبرد. ئەو بۆ عومەر نامەی نوسی و داوای لێکرد لەو کارە دوری بخاتەوە و ئەو بکاتە سەرکردەی دەستەیەك لەموسوڵمانان. عومەر نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا بەرەو نەهاوەند بڕوات. ئەو بەرێکەوت.

دواتر عومەر بۆ عەبدالله کوڕی عێتبانی نوسی چەندین هەزار کەس لەگەڵ نوعمان ڕەوانە بکات تا هەمویان لەماە لەدەوری ئەو کۆببنەوە. خێراترین کەسەکان بۆ ئەم ناوچەیە، کۆتاییەکانی سوپا بون کەهەم دەیانویست بۆ دینەکەی خۆیان هەوڵێك بدەن و هەم لەتالآنیەکان بێ بەش نەبن.

خەڵك بەسەرکردایەتی حوزەیفە کوڕی یەمان و هاورێ لەگەڵ نوعەیم کوڕی موقەرەن هاتنەدەر وبەرێکەوتن تا گەشتنە لای نوعمان. عومەر بەسوپای شەڕکەری ئەهواز فەرمانیدا ئێرانیەکان گرفتار بکەن تا نەتوانن هێرش بکەنە سەر موسوڵمانەکان. فەرماندەیی ئەوان لەدەستی موقتەریب و زێر بو. ئەوان لەسنورەکانی ئیسفەهان مانەوە و ڕێگر بون لەهاوکاری فارسەکان بۆ شەڕکەرانی نەهاوەند. خەڵك لەدەوری نوعمان کوڕی موقەرەن کۆبونەوە و ئەمە کەسانە لەگەورەکان و سەردارانی ئیسلام لەگەڵ ئەواندا بون: حوزەیفە کوڕی یەمان، کوڕەکەی عومەر، جەریر کوڕی عەبدالله بێجلی، موغەیرە کوڕی شەعبە و کەسانیتر. نوعمان، توڵەیحە کوڕی خوەیلد و عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب و کوڕی ئەبی سەلەمی عەمرۆ کوڕی سەنی ڕەوانە کرد تا لەبارودۆخی ئێرانیەکان ئاگاداری بکەنەوە. ئەوان شەو و ڕۆژێك ڕێگایان بڕی و عەمرۆ کوڕی سەنی لەنیوەی ڕێگا گەڕایەوە. وتیان: بۆ گەڕایتەوە؟ وتی: من لەسەرزەمینی ئێران نەژیاوم. (( زانای هەر سەرزەمینێك، ئەو سەرزەمینە دەستەمۆی خۆی دەکات و هەر سەرزەمینێك،

لۆزی ئەزان لەخاك دەدات)). تولەیحە و عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب درێژەیان بەرێگاکەیان دا. عەمرۆ لەکۆتایی شەو گەڕایەوە. وتیان: بۆ گەڕایتەوە؟ وتی: شەو و ڕۆژێك بەرێگادا ڕۆشتم و هیچم نەبینی و گەڕامەوە. تولەیحە ڕۆیشت و گەیشتە نەهاوەند. لەنێوان سوپای موسوڵمانەکان و ئێرانیەکانی نەهاوەند بیست و چەند فەرسەخ ڕێگابو. لەنەهاوەند خەڵك پێیان وت: تولەیحە بۆ جاری دوەم لەدین هەڵگەڕایەوە. ئەو لەو وتاری ئەوان ئاگادار بویەوە و گەڕایەوە. کاتێك ئەویان بینی، تەکبیریان وت. وتی: ئێوە چیتان بەسەر هاتوە؟ ئاگاداریان کردەوە کەدەترسان نەگەڕێتەوە. وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئایینێکی عەرەبی لەئارادا نەبوایە. ئەم عەرەبە پاکانەم بۆ لای ئەو ئێرانیە زمان نەزانانە نەدەبرد. ئەو نوعمانی ئاگادار کردەوە کە لەنێوان ئەوان تا نەهاوەند، هیچ کەس یا هیچ شتێکی ناسازگار نیە.

نوعمان ئاهەنگی ڕۆشتنی کرد و هاورێکانی کەنزیکەی سی هەزار پیاوی شەڕکەر بون. بۆ شەڕ ئامادەی کردن. فەرماندەی پێشەنگەکانی بەنوعەیم کوڕی موقەڕەن سپارد و فەرماندەی باڵی چەپ و ڕاستی بەحوزەیفە کوڕی یەمان و سودید کوڕی موقەڕەن. فەرماندەی سوارەکان قەعقاع کوڕی عەمرۆ و فەرماندەی بەشی کۆتایی سوپاکەی موجاشیع کوڕی مەسعود. هێزە پشتیوانەکانی مەدینە هاورێ لەگەڵ موغەیرە کوڕی شەعبە گەیشتن.. ئەوان گەیشتنە ئەسپیدهان و بینیان ئێرانیەکان بەئامادەبون بۆ شەڕ، چاوەڕوانی گەشتنی ئەوانن. فەرماندەکەیان فیروزان بو و فەرماندەی باڵەکانی چەپ و ڕاست زەردەق و بەهمەن جادویە کەجێگەی برۆ بەستراوی گرتبویەوە. هێزە پشتیوانەکان لەهەر لایەکەوە بۆ نەهاوەند دەهاتن و هەمو ئەو کەسانەی لەقادسیە بەشداریان نەکردبو، هاتبونە نەهاوەند بەئەندازەیەك هێزە شەڕکەرەکانی نەهاوەند کەمتر لەقادسیە نەبو. کاتێك نوعمان ئەوانی بینی، تەکبیری وت و خەڵك تەکبیریان وت و ئێرانیەکان ترس دایگرتن. عەرەبەکان باریان خست و خێوەتەکانیان هەڵدا. گەورەکانی کوفە هاتنە پێش و خێوەتەکانی خۆیان هەڵدا: حوزەیفە کوڕی یەمان، عەقەبە کوڕی عامر، موغەیرە کوڕی شەعبە، بەشیر کوڕی خەصایصە، حەنزەلەی کاتب، جەریر کوڕی عەبداللهی بەجلی، ئەشعەس کوڕی قەیس، وایل کوڕی حەجەر، سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی و کەسانیتر. لەعێراق کەس نەبینرا هاوشێوەی ئەوان

بەجوانی خێوەت هەڵبدات.

دوای ئەوەی باریان خست، نوعمان ئاگری شەڕی هەڵگیرساند. لەرۆژی چوارشەممە و پێنج شەممە بەتەواوی شەڕیان کرد کەهەندێ کات لەبەرژەوەندی ئێرانیەکان و هەندێ کات لەبەرژەوەندی عەرەبەکان بو. ئێرانیەکان لەرۆژی هەینی رۆشتنە ناو سەنگەرەکانی خۆیان و موسوڵمانان ئەوانیان گەمارۆدا و تا ئەو کاتەی خوا ویستی، لەسەریان مانەوە. ئازادی هەڵبژاردن بەئێرانیەکان بو کەهەرکات دەیانویست، دەهاتنەدەر. موسوڵمانان ترسان ئەم کارە درێژە بکێشێت تا ئەوەی لەیەکێك لەرۆژەکانی هەینی فرمزانەکانی سوپای ئیسلام کۆبونەوە و راوێژیان کرد. وتیان: دەبینین ئەوان لەزیانی ئێمە ئازادی هەڵبژاردنیان هەیە. رۆشتنە لای نوعمان و دەوری ئەویان گرت و بینیان ئەویش سەرقاڵی ئەو بابەتەیە کەئەوان پێوەی سەرقاڵ بون. ئاگاداریان کردەوە. ئەو کەسی بەدوای پاڵەوانەکان و فرمزانەکان کرد و بۆ ئەو کۆبونەوە بانگێشتی کردن. نوعمان دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: ئێرانیەکان دەبینن کەلەناو سەنگەر و شارەکانی خۆیان پشت گەرم و بەهێز بون و جگە لەو کاتانەی خۆیان بیەوێت نایێنەدەر و موسوڵمانان توانای ئەوەیان نیە ئەوان بێننەدەر. دەبینن موسوڵمانان کەوتونەتە چ تەنگانەیێکەوە. رێگە چارە چیە تا ئەوان بێنینە ناو گۆڕەپانی شەڕ و رێگر بین لەدرێژە کێشانی ئەم بارودۆخە؟

عەمرۆ کوڕی سەنی کەبەتەمەنترینی ئەوان بو، کەوتە قسە و وتی: لەناو سەنگەرمانەوەدا بۆ ئەوان دژوارترە لەگەمارۆدانی ئێوە لەوان. گەمارۆ لەسەر ئەوان هەلگرە و هەر کەس هاتەدەر، شەڕی لەگەڵ بکە. ئامادەبوان بەبۆچونەکەی رازی نەبون. عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب دەستی بەقسە کرد و وتی: روبەروی ئەوان ببە و شەڕیان لەگەڵ بکە و بەهیچ جۆرێك پاشەکشێ مەکە. ئامادەبوان هەمویان بۆچونەکەیان بەناپەسەند زانی و وتیان: ئەوە دیوارەکانن رێگرن و زیان لەئێمە دەدەن.

توڵەیحە وتی: بڕوام وایە پیاوێك رەوانە بکەین تا شەڕیان لەگەڵ بکات و کاتێك شەڕیان لەگەڵ دەکات ئەوان بەرەو سوپاکەی خۆمان بێنێت، چونکە بەدرێژایی ئەم شەڕە ئەوانمان لەسوپاکەی خۆمان نزیك نەکردۆتەوە. کاتێك ئەمە ببینن چاوی تەماح دەبڕنە ئێمە و ئێمە شەڕیان لەگەڵ دەکەین تا خوا سەبارەت بەوان و بەوەی شیاوە بۆ

فەرماندان، فەرمان بدات. نوعمان کوڕی موقەرِن. قەعقاع کوڕی عەمرۆی کردە فەرماندەی سوارەکان. ئەو ئاگری شەڕی خۆش کرد وئێرانیەکانی لەسەنگەرەکانیان هێنایەدەر. ئێرانیەکان هاتنەدەر و هاوشێوەی ستونە ئاسنینەکان بون. ئەوانیان بەیەکترەوە بەستبو تا رانەکەن. ئەوان چەندین دەستەی شەڕکەریان دروست کرد و هەر حەوت کەس بەزنجیرێکەوە بون. تەلی دڕکاویان لەپشت سەری خۆیان بەجێهێشتبو تابۆ دواوە پاشەکشێ نەکەن. کاتێك هاتنەدەر، قەعقاع پاشەکشێی کرد و دوبارە پاشەکشێی کرد بەرادەیەك ئێرانیەکان چاوی تەماحیان بڕیە موسوڵمانەکان و ئەم بارودۆخەیان بەدەرفەت زانی. ئەو کاریان کرد کەتوڵەیحە پێشبینی کردبو. وتیان: بەسەر عەرەبەکاندا سەرکەوتین! جگە لەو کەسانەی لەسەر دەروازەکان بون، کەس لەشوێنەکەی خۆی نەمایەوە. ئێرانیەکان دڵ ئاسودە بۆ پێشەوە پێشڕەویان کرد. قەعقاع ڕۆشتە ناو دڵی سوپای موسوڵمانان. فارسەکان تا ئەندازەیەك لەسەنگەرەکانی خۆیان دورکەوتنەوە و موسوڵمانەکان لەنیمەڕۆی رۆژی هەینی بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کردبو. نوعمان پێشنیارە پێویستەکانی بەخەڵکدا و فەرمانی بەواندا لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە و تا ئەو فەرمان نەدات، شەڕ دەست پێنەکەن. خەڵك ئەو کاریان کرد و لەبەرابەر تیربارانی دوژمن لەژێر قەڵغانەکاندا خۆیان حەشاردا. ئێرانیەکان هێرشیان کرد و بەتیرە گیانبڕەکان ئەوانیان بێزار کرد.

دەستەیەك لەخەڵك گلەییان بردە لای نوعمان و وتیان: ئایا نابینیت حیمان بەسەر دێت؟ چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ فەرمان بەخەڵك بدە تا شەڕ بکەن. نوعمان وتی: ئارام بن، ئارام بن. نوعمان بۆ دەست پێکردنی شەڕ، چاوەڕوانی خۆشەویست ترین کاتەکاتی دەکرد کەپێغەمبەر(ص)ی خوا بۆ هێرش کردنە سەر سوپای دوژمن دەیکرد یانی کۆتایی رۆژ. کاتێك، ئەو دەمە نزیك بویەوە، سوار ئەسپەکەی خۆی لای خەڵکانەوە تێپەری کرد و لای هەر ئالآیەك وەستا و مژدە و مزگێنیەکانی خوای بیرخستنەوە و ئەوانی بۆ شەڕ هاندا و هیوای سەرکەوتنی لەدڵی ئەواندا زیندو کرد. بەوانی وت: سێ جار تەکبیر دەڵێم، کاتێك تەکبیری سێیەم بڵێم، هێرش دەبەم و ئێوەیش هێرش بەرن. ئەگەر کوژرام، دوای من حوزەیفە فەرماندە بێت و ئەگەر ئەو کوژرا، فلاّن کەس. ئەو تا حەوت کەسی ناوبرد کەدوایین کەسیان موغەیرە کوڕی شەعبە بو. دواتر وتی: ئەی

خوایە، ڕێز لەئایینەکەت بگرە و هاوکاری بەندەکانت بکە و نوعمان بکەرە یەکەم شەهیدی ئەمڕۆ بۆ ڕێز گرتن لەئایینەکەت و بەندەکانت.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو، بەڵکو وتی: ئەی خوایە، لەتۆ داوا دەکەم چاوەکانی من بەسەرکەوتن درەوشاوە و رون بکەیت کەڕێز گرتنی ئیسلامی تیا بێت و دواتر بۆ لای خۆتم ببەیتەوە. خەڵك گریان. ئەو بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە و سێ جار تەکبیری وت و خەڵك چاوەڕوان و ئامادەی شەڕ بون. نوعمان هێرش کرد و خەڵکیش بەهەمان شێوە و ئاڵاکان هاوشێوەی هەڵۆ فڕین. نوعمانیان بەکڵاو و ڕۆپۆشی سپیەوە دەناسی. شەڕێکی قورسی ئەوتۆیان هەڵگیرساند کەمێژوونوسان هیچ کات هاوشێوە و هاوتای ئەو شەڕەیان نەبینیوە. جگە لەدەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان هیچ دەنگێك بەگوێ نەدەگەیشت. موسوڵمانەکان سەرکەوتوانە لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگریان دەکرد. ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و لەکاتی نیمەڕۆ تا هاتنی تاریکی، ئەوەندەیان لێ کوژرا کەخوێنی کوژراوەکان دەبوە هۆی هەڵخلیسکانی پێی شەرکەران و چوارپێکان.

کاتێك خوا چاوی نوعمان بەسەرکەوتن رون کردەوە، وەڵامی داواکەی دایەوە و گیانی بەرەو ئاسمان برد. دەستەیەك دەڵێن: تیرێکی بەرکەوت و ئەوی خستە سەر خاك. براکەی نوعەیم ئەوی لەجلەکانیەوە ئاڵاند و ئاڵاکەی هەڵگرت و تەسلیمی حوزەیفەی کرد. ئەو ئاڵاکەی وەرگرت و ڕۆشتە شوێنەکەی نوعمان و نوعەیمی رەوانەی شوێنەکەی خۆی کردەوە. موغەیرە وتی: گیاندانی فەرماندەی خۆتان بشارنەوە تا ببینین خوا سەبارەت بەوان وئێمە چی دەکات نەکا خەڵك ترس بەسەریاندا زاڵبێت. موسوڵمانان شەڕیان کرد. کاتێك شەو خێوەتی ڕەشی خۆی بەسەر ئاسمانی گۆڕەپانی شەڕدا بڵاو کردەوە، ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتن. ڕێگاکەیان کوێر بویەوە و لەبەر ئەمە وازیان لێهێنان و ئەوان رویان کردە کەلێنی کێوێك کە لەئەسپیدهان لەو شوێنەدا سەنگەریان گرتبو. هەمویان تێی کەوتن. یەك لەوان دەکەوتە ناو چاڵەکە و شەش کەسی بەدوایدا خۆیدا دەبرد و دەکوژران چونکە هەمویان بەزنجیر پێکەوە بەسترابونەوە. تەلە درکاویەکان ئێرانیەکانیان بێزار کردبو. لەئێرانیەکان سەد هەزار کەس یا زیاتر لە کەلێنی ئەو کێوەدا لەناوچون و ئەمە جگە لەکوژاروەکان لەگۆڕەپانی شەڕ بو.

دەستەیەك دەڵێن: لەكەلێنی ئەو كێوەدا هەشتا هەزار كەس كوژران و لەشەڕەكەدا سی هەزار كەس جگە لەو كەسانی لەكاتی شوێن كەوتنی موسوڵمانان كوژران. جگە لەدەستەیەكی ئاوارە كەس رزگاری نەبو. فیروزان رزگاری بو و بەرەو هەمەدان رایكرد. نوعەیم كوڕی موقەرن شوێنی كەوت و قەعقاع كوڕی عەمرۆ لەپێشەوە هێرشی كردەسەر و لەسەر تەپۆلكەی هەمەدان روبەروی بونەوە. رێگا لێوانلێو بو لەئێستر و كەری بارقورس لەهەنگوین. چوارپێكان وەك بڵێی هۆكاری كۆتایی ژیانی ئەو بون. رێگایان لێ بەست و كاتێك هیچ رێگایەكی نەبینی، لەئەسپەكەی دابەزی و بەرەو كێوەكە رۆیشت. قەعقاع پیادە شوێنی فیروزان كەوت و دۆزیەوە. موسوڵمانان لەسەر تەپۆلكەی هەمەدان فیروزانیان گرت و كوشتیان و وتیان: خوا سوپایەكی لەهەنگوین هەیە. هەنگوین و باردكانیان هەڵگرت و ئەو تەپۆڵەكەیان بەتەپۆلكەی هەنگوین ناو برد.

ئێرانیەكان رۆشتنە ناو هەمەدان و موسوڵمانەكان شوێنیان كەوتن. لەدەوروبەری هەمەدان دابەزین و گەمارۆی ئەوانیاندا. كاتێك خوسرەو شەنوم ئەمەی بیست، داوای ئەمانی كرد. كاتێك موسوڵمانەكان لەسەركەوتن دڵنیا و ئاسودە بون، بەدوای فەرماندەكەی خۆیان نوعمان كوڕی موقەرن گەڕان. براكەی مەعقەل كوڕی موقەرن بەوانی وت: ئەوە فەرماندەكەتانە كەخوا چاوەكانی بەسەركەوتن رون كردەوە و دواتر كاری ئەوی بەكوژران لەرێگای خوادا كۆتایی پێهێنا. دوای ئەو، گوێ لەفەرمانەكانی حوزەیفە بگرن.

موسوڵمانەكان لەرۆژی شەڕ دوای شكەستی ئێرانیەكان، رۆشتنە نەهاوەند و ئەوەی لەساز و بەرگ و كەل و پەل و كەرەستەی شەڕ و باروبنە و خواردەمەنی بو. وەك تالآنی هەڵیانگرت و تەسلیمی سەرپەرەستی تالآنیە دەست بەسەرگیراوەكان یانی سایب كوڕی ئەقرەعیان كرد. ئەو كەسانەی لەنەهاوەند بون، چاوەڕوان بون تا هەواڵی براكانیان یانی ئەوانەی لەگەڵ قەعقاع كوڕی عەمرۆ رۆیشتبون، ببیستن. هیربۆد، خواوەندی ئاتەشكەدە هات و داوای ئەمانی كرد. بەحوزەیفەی وت: ئایا من لەگەڵ ئەو كەسانەی داوای ئەمانیان بۆ دەكەم، ئەمان دەدەیت تا پاشەكەوتەكانی خوسرەوت لەزێر و زیو بۆ رۆژی تەنگانە نیشان بدەم؟ حوزەیفە وتی: بەڵێ. ئەو گەوهەرە گرانبایەكانی لەدو

سەوەتەدا هێنا. حوزەیفە گەوهەرەکانی لەگەڵ پێنج یەك بۆ لای عومەر رەوانە کرد. ئەو بەشی شەڕکەرانی بەخشی و پاشماوەکەی هاورێ لەگەڵ سایب کوڕی ئەقرەع بۆ لای عومەر رەوانە کرد. ئەو دەبیرێکی شارەزا بو. عومەر ئەوی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد و وتی: ئەگەر خوا سەرکەوتنی پێ بەخشین، تالآنیەکان لەناو موسوڵمانان دابەش بکە و پێنج یەك هەڵبگرە. ئەگەر ئەم سوپایە لەناو چو، ئەوسا ژێر زەوی باشتر دەبێت لەسەر زەوی.

سایب دەڵێت: کاتێك خوا سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و پیاوی فارسی دو سەوەتەی پڕ گەوهەری هێنا کەنەخەیرخان بەوی سپاردبو، بینیان مروارید و زەبەرجەد و یاقوتی فراوانی تیایە. کاتێك لەدابەش کردنی تالآنیەکان تەواو بوم، ئەوانم برد و رۆشتمە لای عومەر. عومەر چۆنیەتی شەڕی پێشبینی کردبو و شەو بەئاگا مابویەوە و دەتلایەوە و چاوەڕوانی گەشتنی هەواڵەکانی دەکرد. لەم ناوەدا یەکێك لەموسوڵمانان بەنیازێك شەو هاتبوەدەر و بۆ مەدینە گەڕابویەوە. سوارەیەك لای ئەم پیاوە تێپەڕی و پیاو لێی پرسی: لەکوێوە دێیت؟ وتی لەنەهاوەند کەتیایدا موسوڵمانان سەرکەوتن و نوعمان کوژرا. کاتێك پیاو شەوی گەیاندە بەیانی، سێ رۆژ دوای شەڕ، سەبارەت بەسەرکەوتنی موسوڵمانان قسەی کرد (کەهێشتا هیچ هەواڵێك نەگەیشتبو). هەواڵەکان بەعومەر گەیشت و ئەو پرسیاری کرد و پیاوەکە چۆنیەتی شەڕەکەی باس کرد. عومەر وتی: ئەو پەیکێك بو لەپەریەکان.

دوای ئەوە پەیکی راستینی موسوڵمانان گەیشتە لای عومەر. هەواڵێکی پێدا بوە هۆی خۆشحاڵی ئەو بەلآم لەکوژرانی سەرداری سوپاکەی نوعمان کوڕی موقەڕن هیچی باس نەکرد. سایب دەڵێت: عومەر لەبەیانی ئەو رۆژەوە دەهاتەدەر و چاوەڕوانی گەیشتنی هەواڵەکانی دەکرد. دەڵێت: رۆشتمە لای ئەو و پرسیاری کرد: چ هەواڵێکت پێیە؟ وتم: باشی و خۆشی ئەی سەروەری باوەڕداران. خوا تۆی سەرکەوتو کرد و باشترین سەرکەوتنی بەتۆ بەخشی بەلآم نوعمان کوڕی موقەڕن شەهید کرا. عومەر وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). دواتر دەستی کرد بەگریان و بەئارامی دەینالآند تا ئێسقانەکانی شانی دەرکەوتن. دەڵێت: کاتێك ئەمەم بینی و تێگەیشتم کەچ حاڵێکی هەیە، وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوای ئەو

کەسانی ناودار و ناسراوی دیکە نەکوژران. عومەر وتی: هەمو ئەو خەڵکە داماوە هەژارە! بەڵام ئەو خوایەیی ئەوانی بەشەهید بون ڕێزدار کرد، ئەوان باش دەناسێت و نەژاد و روخساری هەرکامیان بەباشی دەزانێت. ناسینی عومەر بەکەڵکی ئەوان نایەت! دواتر هەواڵی دو سەوەتە گەوهەرەکەم پێدا. فەرموی: ئەوان بەگەنجخانە بسپێرە تا بزانین چیان لێبکەین. دواتر خۆت بەیەکەم دەستەی شەرکەر بگەیێنە. دەڵێت: ئەو کارەم کرد و بەپەلە بەرەو کوفە بەرێکەوتم.

عومەر شەوی کردە رۆژ. کاتێك بەیانی بویەوە نێردراوێکی بەدوای مندا رەوانە کرد. ئەو منی نەدۆزیەوە تا ئەو کاتەی گەشتمە کوفە و وشترەکەم خەواند و ئەو وشترەکەی لەپاڵ وشترەکەی مندا خەواند و وتی: برۆ بۆ لای سەرودەری باوەڕداران چونکە منی بەدوای تۆدا رەوانە کردوە بەڵام نەمتوانی تا ئێرە خۆم بەتۆ بگەیێنم. دەڵێت: لەگەڵ ئەو سوار بوم تا گەیشتمە لای عومەر، کاتێك منی بینی، فەرموی: وەرە لای من سایب تا بزانم دەبێت چی بکەین! وتم: بۆ؟ وتی: هاوار لەتۆ، لەو شەوەی کەرۆشتی، هەر ئەوەندەی چاوم خستە سەریەك و خەوتم، فریشتەکان هاتن و منیان بۆ لای دو سەوەتەی پڕگەوهەر بانگێشت دەکرد کە لەهەر دوکیانەوە ئاگر بڵێسەی دەسەند. فریشتەکان دەیانوت: ئەوان داغ بکەین و بیخەینە سەر ناوچاوان و پشت و کەلەکەت. من دەموت: لەناو موسڵمانانندا دابەشی دەکەم. ئێستا ئەی سایب، ئەم دو سەوەتە هەڵگرە وبیانفرۆشە و بیسپێرە بەشوێنی دابەش کردنی تاڵانیەکان بەسەر موسوڵمانان. دەڵێت: دو سەوەتەکەم هەڵگرت و لەبەر دەرگای مزگەوتی کوفە خستمە سەر زەوی. عەمرۆ کوڕی حەدیسی مەخزومی هەردوکیانی بەدوهەزار هەزار (دوملیون درەم) لەمن کڕی و دواتر بردیە سەرزەمینی ئێرانیەکان و بەچوار هەزار هەزار (چوار ملێون درەم) فرۆشتی. لەمە دوا ئەو وەك دەوڵەمەندترین پیاوی کوفە لەقەڵەم دەدرا. لەنەهاوەند بەشی سوارەکان شەش هەزار درەم و بەشی پیادەکان دوهەزار درەم بو.

کاتێك دیلەکانی نەهاوەند گەیشتنە مەدینە، ئەبو لۆلۆ کۆیلەی موغەیرە کوڕی شەعبە، کاتێك هەر منداڵێکی لەنەسیرەکان دەبینی، دەستی بۆ سەری دەبرد و دەگریا و دەیوت: عومەر جەرگی منی خوارد! ئەو لەخەڵکی نەهاوەند بو کەسەرەتا رۆمیەکان ئەسیریان کرد و دواتر موسوڵمانەکان. لەبەر ئەمە بەناوی ئەو شوێنە بانگیان دەکرد کەتیایدا

ئەسیر کرا.

موسوڵمانان شەڕی نەهاوەندیان بەسەرکەوتنی سەرکەوتنەکان ناودەبرد چونکە دوای ئەم شەڕە ئێرانیەکان توانای کۆکردنەوەی خۆیان و ڕێکخستنەوەی دوبارەی خۆیان بەدەست نەهێنایەوە و لەبەر ئەمە موسوڵمانان سەراسەری خاکەکەی ئەوانیان بەچوارپێکانی خۆیان بڕی.

## دەست بەسەرداگرتنی دینەوەر و سەیمەرە و شوێنەکانی دیکە

کاتێك ئەبو موسا ئەشعەری ( کەبەسەرکردایەتی هێزە پشتیوانەکانی بەسرە هاتبو) لەنەهاوەند گەڕایەوە، لای دینەوەر تێپەڕی و پێنج ڕۆژ لەوێ مایەوە تا خەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. ئەو بەرێکەوت و لەسیروان لای خەڵکانی ئەو ناوچەیە دابەزی و ئەوانیش هاوشێوەی خەڵکانی دینەوەر پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. ئەو سایب کوڕی ئەقرەعی سەقەفی بۆ سەیمەرە شاری مێهرجانی قەزەق ڕەوانە کرد و بەئاشتی دەستی بەسەرداگرت. دەستەیەك دەڵێن: ئەو سایبی لەئەهوازەوە ڕەوانە کرد کەپارێزگای مێهرەجانی قەزەق بو.

## دەست بەسەرداگرتنی هەمەدان و ماهین و شوێنەکانی دیکە

کاتێك ئێرانیەکان شکەستیان خوارد، ئەو کەسانەی ڕزگاریان بو، ڕویان کردە هەمەدان و نوعەیم کوڕی موقەڕەن و قەعقاع کوڕی عەمرۆ ئەوانیان گەمارۆدا. کاتێك خوسرەو شەنوم ئەمەی بینی، داوای ئەمانی کرد وبەدانی باج ڕازی بو لەسەر ئەو بنەمایەی کەهەمەدان و دەستبی لەزیانی موسوڵمانەکان بەدور بێت و دوژمنانیش نەتوانن لەڕێگەی هەمەدان و دەستبی زیان لەموسوڵمانەکان بدەن. موسوڵمانەکان بەم پێشنیارە ڕازی بون و خوسرەو شەنوم و هاوڕێکانیان ئەمان بەخشی. هەمو ئەو کەسانەی هەڵاتبون، گەڕانەوە. ئەم هەواڵە بەماهین گەیشت کەهەمەدان دەستی بەسەرداگیراوە و کەوتۆتە دەست موسوڵمانەکان و نوعەیم کوڕی موقەڕەن و قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەو شارە دابەزیون. ئەوان لایەنگیری خوسرەو شەنومیان کرد و پەیك وپەیامیان بۆ لای حوزەیفە ڕەوانە کرد کە بەپێشنیارەکانی ئەوان ڕازیبو. ئەوان لەسەر ڕازی بون

بەفەرمانی موسوڵمانەکان هاودەنگ بون و یەك دڵ و یەك زمان بڕیاریاندا بڕۆنە لای حوزەیفە. دینار یەکێك لەپاشاکانی ئەوان خەڵکانی ماهینی فریودا. گەورەترین پاشاکەیان قارن بو. دینار بەوانی وت: بەزێر و زیو و رازاندنەوەی تەواو مەڕۆنە لای موسوڵمانەکان. ئەو خۆی گۆڕی و بەزێر و زیوی تەواوی روی لەموسوڵمانەکان کرد و نیازەکانی ئەوانی بەراوەردە کرد. موسوڵمانان بەداواکاریەکانی ئەوان رازی بون ولەسەر ئەم بنەمایە پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەستن. کەسانیتر چارەیەکیان جگە لەوە نەبینی کەلایەنگیری بکەن و بەپەیمانەکەی ئەو رازی بن. لەبەر ئەمە ئەویان بەماە دینار ناوبرد. نوعمان کوڕی موقەرەن ئەم پەیمانەی لەگەڵ بەهزادان بەستبو و لەبەر ئەمە ئەویان بۆ بەهزادان گەڕاندەوە. نەسیر کوڕی سور لەسەر قەڵایەك دانرابو کەدەستەیەك لەخەڵکان پەنایان بۆ بردبو. ئەم قەڵای گرت و قەڵاکەیان بەنەسیر ناوبرد کەکورت کراوەی نەسرە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم دینارە لەرۆژگاری خەلافەتی معاویە هاتە کوفە و وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، ئێوە کاتێك لای ئێمە تێپەڕین، باشترینی خەڵکان بون و لەرۆژگاری عومەر و عوسمان بەمشێوەیە مانەوە و دواتر گۆڕان و چوار خو لەناو ئێوەدا بڵاو بویەوە: پەیمان شکێنی، رژدی، فێڵ و فریو و کورت بینی. هیچ کام لەمانە لەناو ئێوە نەدەبینرا. بەباشی لەئێوەم روانی و ئەم خو و عادەتانەم لەناو گەنجەکانی ئێوەدا بینی. زانیم ئەم زیانە لەکوێوە بەرئێوە گەیشتوە: رژدیتان لەفارسەکان پێبڕاوە، فێڵ و فریوتان لەنبتیەکان، پەیمان شکێنیتان لەخوراسانیەکان و کورت بینیتان لەنەهوازیەکان.

## هاتنی موسوڵمانەکان بۆ سەرزەمینەکانی ئێران

لەم ساڵەدا عومەر فەرمانیدا موسوڵمانان بڕۆنە قوڵایی خاکی ئێران و لەهەر شوێنێك ئێرانیەکانیان بینی، شوێنیان بکەون. دەستەیەك دەڵێن: ئەمە لەساڵی ٦٣٩/١٨ زایینی رویدا کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. هۆکاری ئەم کارە، کرداری یەزدگێرد بو کەیەك لەدوای یەك سوپاکانی بۆ شەڕی موسوڵمانان رەوانە دەکرد. عومەر دوای گرتنی شاری نەهاوەند، فەرماندەکانی لەناو خەڵکانی بەسرە و کوفە رەوانە کرد. لەپانتاییەکانی

نێوان سەعد کوڕی وەقاص و عەماری یاسر دوفەرماندە بون: یەکیان عەبداللە کوڕی عەبداللە کوڕی عێتبان کە لەزەمانی ئەو شەڕی نەهاوەندا رویدا و ئەویتریان زیاد کوڕی حەنزەلە هاوپەیمانی بەنی عەبد قوصەی کە لەزەمانی ئەو فەرمانی رۆشتن بۆ ناو قولایی خاکی ئێران دەرکرا. عەبداللەیان لەسەر کار لابرد وبۆ ناوچەیەکی دیکەیان رەوانە کرد و زیادیان کردە فەرماندە. ئەو لەموهاجیرەکان بو کەرۆژگارێکی کەم لەسەر کارەکەی مایەوە و دواتر پێداگری کرد تا لەسەر کارەکەی دوری بخەنەوە و عومەر ئەوی لەکارەکەی دورخستەوە و عەماری یاسری خستە شوێنەکەی. عومەر لەگەڵ عەمار نامەیەکی بۆ خەڵکی کوفە نوسی بەم شێوەیە: من عەمار کوڕی یاسرم وەك فەرماندار رەوانە کرد و عەبداللە کوڕی مەسعود وەك مامۆستای ئەو. عەبداللە کوڕی مەسعود لەحمص بو کەعومەر رەوانەی کوفەی کرد. عەبداللە کوڕی عەبداللە ی بۆ هاوکاری خەڵکی بەسرە رەوانە کرد و ئەبوموسای ئەشعەری بۆ هاوکاری خەڵکی کوفە. خەڵکی هەمەدان دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی، دوبارە ناباوەڕ بونەوە. عومەر ئاڵایەکی بۆ نوعەیم کوڕی موقەرەن نارد و فەرمانی پێدا رەوانەی هەمەدان بێت. و کاتێك دەستی بەسەردا گرت بەرەو خوراسان بەرێکەوێت. عەتەبە کوڕی فەرقەد و بوکەیر کوڕی عەبداللەی بۆ ئازەربایەجان رەوانە کرد و فەرمانیدا یەکیان لەحیلوانەوە بڕوات و یەکیان لەموسڵ. عەبداللە کوڕی عەبداللە ی رەوانەی ئیسفەهان کرد و سوراقەی لەبەسرە دانا.

## دەست بەسەردا گرتنی ئیسفەهان

عومەر لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی عەبداللە ی رەوانەی ئیسفەهان کرد. ئەو پیاوێکی ئازا لە بوێرەکان و ناودارانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ص) و لەروخسارە دیارەکانی ئەنسار و هاوپەیمانی بەنی حەبلی بو. ئەبو موسای ئەشعەری بۆ هاوکاری کردنی ئەو نارد. ئەو فەرماندەیی باڵەکانی چەپ و راستی سوپاکەی خۆی بەعەبداللە کوڕی وەرقای ریاحی و عەصمە کوڕی عەبداللە سپارد. ئەوان بەرەو نەهاوەند بەرێکەوتن و حوزەیفە گەڕایەوە بۆ شوێنی فەرمانڕەواییەتی خۆی لەسەر دیجلە و دەوروبەری.

عەبداللە لەگەڵ هاورێکان و شوێنکەوتوانی خۆی لەسوپاکەی نوعمان کوڕی موقەرەن

کەلەنەهاوەند جێگیر بون، بەرەو ئیسفەهان بەرێکەوت. سەرکردەی سوپاکەی ئیسصفەهان ئسپیدان و فەرماندەی پێشەنگەکان پیرەپیاوێکی بەتەمەن بەناوی شەهریار کوڕی جادویە. سوپایەکی گەورە بو. پێشەنگی سوپای ئێرانیەکان لەدێهاتەکانی ئیسفەهان بون. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و پیرەپیاوی بەتەمەن هاتە ناوەڕاستی گۆڕەپان و داوای شەڕکەری کرد. عەبدالله کوڕی وەرقای ریاحی روبەروی بویەوە و کوشتی و بەم پێیە خەڵکی ئیسفەهان شکەستیان خوارد. لەوکاتەوە تا ئێستا ئەو شوێنە بەدێهاتی (پیر) ناودەبەن. ئیسپیدان لەسەر بنەمای دانی دێهاتی پیر بەموسوڵمانان پەیمانی لەگەڵ بەستن. یەکەم دێهات بو لەئیسفەهان دەستی بەسەرداگیرا.
دواتر عەبدالله کوڕی عەبدالله بەرەو شاری جی بەرێکەوت کەهەمان شاری ئیسفەهانە. ئەو گەیشتە ئیسفەهان و بینی پاشاکەی پادوسپانە. موسوڵمانانی لەدەوروبەری جی جێگیر کرد و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و شەڕی دەست پێکرد. پادوسپان لەسەر بنەمای بەخشینی ئیسفەهان پەیمانی لەگەڵ بەست بەو مەرجەی هەر کەس لەناو شاردا ماوەتەوە، باج بدات و سامانەکەی پارێزراو بێت و هەرکەس زەویەکانی بەزۆر دەستی بەسەرداگیراوە، زەویەکەی بۆ بگەڕێتەوە و باج بدات و هەر کەس شەڕبکات و بمرێت، سامان و زەویەکەی بۆ موسوڵمانان بێت. ئەبو موسای ئەشعەری لەپانتاییەکانی ئەهوازەوە گەیشتە لای عەبدالله کوڕی عەبدالله و بینی کە ئەو پەیمانی ئاشتی بەستوە. خەڵك لەجی هاتنەدەر و ئەمانیان پێدرا و ئەمانە جگە لەو سی کەسە بون کەبەرەو کرمان بەرێکەوتن. عەبدالله و ئەبوموسای ئەشعەری رۆشتنە ناو شاری جی و عەبدالله ئەم هەواڵەی بۆ عومەر نوسی. نامەی عومەر بۆ عەبدالله گەیشت کەدەیوت: بەرێکەوە تا لای سوهەیل کوڕی عودەی دابەزی و هاوڕێ لەگەڵ ئەو شەڕی خەڵکانی کرمان بکەیت. ئەو بەرێکەوت و سایب کوڕی ئەقرەعی وەك جێگری خۆی لەئیسفەهان بەجێهێشت. پێش ئەوەی سوهەیل بگاتە کرمان، عەبدالله خۆی گەیاند.
دەستەیەك دەڵێن: لەمەعقەل کوڕی یەسار گێرانەوەیەکی مێژووییمان بەدەست گەیشتوە کەفەرماندەی ئەو سوپاییەی دەستی بەسەر ئیسفەهاندا گرت، نوعمان کوڕی موقەرەن بو. عومەر ئەوی لەمەدینەوە رەوانەی ئیسفەهان کرد و نامەی بۆ خەڵکی کوفە نوسی تا هاوکاری بکەن. ئەو رۆشتە ئیسفەهان و بینی پاشاکەی (دوبرۆ)

فەرمانڕەوایەتی ئەم شارە دەکات. ئەو موغەیرە کوڕی شەعبەی رەوانەی جەنگ کرد و گەڕایەوە. موغەیرە شەڕی کرد و ئەوانی تێك شکاند و نوعمان کوژرا و دوبرۆ لەئەسپ کەوتە خوار و ورگی هەڵدرا و سوپاکی شکەستی خوارد. مەعقەل دەڵێت: رۆشتمە سەر نوعمان کوڕی موقەرەن کە لەسەر زەوی کەوتبو، لەسەر سەری نیشانەیەکم دانا. کاتێك ئێرانیەکان شکەستیان خوارد، دەفرێك ئاوم هەڵگرت و رۆشتمە لای و خاك و خۆڵم لەروخساری شۆرد. وتی: خەڵك چیان بەسەر هات؟ وتم: خوا سەرکەوتنی پێ بەخشین. وتی: سوپاس بۆ خوا. دواتر چاوەکانی بەست.

گێرانەوەی راست ئەوەیە کەنوعمان لەنەهاوەند کوژرا و ئەبو موسا دەستی بەسەر قوم و کاشاندا گرت.

## فەرمانڕەوایی موغەیرە کوڕی شەعبە لەکوفە

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب عەمار کوڕی یاسری لەکوفە جێگیر کرد و عەبدالله کوڕی مەسعودی کوڕی کردە سەرپەرەستی گەنج خانەکانی کوفە. خەڵکی کوفە لەدەستی عەمار کوڕی یاسر گلەیی و گازندەیان بردە لای عومەر. و عەمار داوای لەعومەر کرد لەم کارە دوری بخاتەوە و عومەر ئەو کارەی کرد. دواتر جوبەیر کوڕی موتعەمی کردە فەرمانڕەوایی کوفە وپێی وت: ئەمە بەهیچ یەك لەموسوڵمانان مەڵێ (بەڵام جوبەیر بەهاوسەرەکەی خۆی وت). موغەیرە بیستی کەعومەر بەتەنیا لەگەڵ جوبەیر دانیشتوە (کۆبۆتەوە). هاوسەرەکەی خۆی نارد تا خواردنی سەفەرییان پێ بدات. هاوسەری جوبەیر وتی: پیرۆزباییەکەی باشت لەمن کرد. کاتێك موغەیرە زانی بوچونەکەی راست بوە و عومەر دەیەوێت جوبەیر بکاتە فەرمانڕەوایی کوفە، رۆشتە لای عومەر و پێی وت: پیرۆزت بێت ئەو فەرمانداری هەڵتبژاردوە! موغەیرە ئاگاداری کردەوە کەدەزانێت جوبەیر دەیەوێت بۆ فەرمانداری کوفە بڕوات. عومەر ئەوی لەسەرکار لابرد و موغەیرە کوڕی شەعبەی خستە جێگەکەی.

موغەیرە فەرمانڕەوایی کوفە بو تا عومەر مرد. دەستەیەك دەڵێن: عەمار کوڕی یاسر لەساڵی ٢٢/٦٤٣ زایینی لەسەر کار لابرا و دوای ئەو ئەبو موسای ئەشعەری هاتە سەر کار. بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

## باس كردنی چەند روداوێكیتر

دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا عەمرۆ كوڕی عاص، عوقەبە كوڕی نافعی فەهری ردوانە كرد و ئەو بەئاشتی دەستی بەسەر زدویلەدا گرت. نێوان بەرقە تا زەویلە بەشێوەی ئاشتی كەوتە دەستی موسوڵمانان. دەستەیەك دەڵێن ئەمە لەساڵی ٦٤١/٢٠ زایینی رویدا.

فەرماندارەكان لەم ساڵەدا ئەمانە بون: عومەیر كوڕی سەعد فەرمانداری دەمشق و حوران و حمص و قێنسرین و جەزیرە، معاویە فەرمانداری بەلقا و فەلەستین و ئەردەن و كەناردكان و ئەنتاكیە و قەلقیە و مەعردی مصرین. لەم كاتەدا ئەبو هاشم كوڕی عەتەبە كوڕی رەبیعە لەقەلقیە و ئەنتاكیە و مەعرەی مصرین پەیمانی ئاشتی بەست.

هەروەها لەم ساڵەدا حەسەنی بەصری هاتەدنیا.

لەم ساڵەدا عومەر حەجی كرد. ئەو زەید كوڕی سابتی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دیاری كرد. فەرماندارەكانی ئەو لەمەككە، تایف، یەمەن، یەمامە، میصر و بەسرە، كەسانی پێشوبون. لەكوفە عەمار كوڕی یاسر و لەسەر دامەزراوەی داد شەریح.

هەروەها لەم ساڵەدا عوسمان كوڕی ئەبی ئەلعاصی بۆ كەناردكانی ئێران ردوانە كرد كەشەڕی لەگەڵ ئێرانیەكان كرد. جارودی عەبدی لەگەڵ ئەم سوپادابو و لەشوێنێك كوژرا كەدواتر پێیان وت (گەردەنەی جارود). دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە ئەبو بەلكو لەگەڵ نوعمان كوڕی موقەرەن لەنەهاوەند كوژرا.

هەروەها لەم ساڵەدا حەممە مرد. ئەو لەهاورێیانی پێغەمبەر(ص) بو. ئەو دوای گرتنی شاری ئیسفەهان لەم شارەدا مرد.

عەلا كوڕی حەزرەمی فەرمانڕەوای بەحرەین لەم ساڵەداماڵئاوایی لەدنیا كرد. عومەر لەجێگای ئەو ئەبو هورەیرەی دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا خالید كوڕی وەلید لەحمص ماڵئاوایی لەجیهان كرد و عومەر كوڕی خەتابی كردە سەرپەرەستی ماڵ و سامانەكەی خۆی. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٤٤/٢٢ زایینی كۆچی دوایی كرد و دەستەیەك دەڵێن: لەمەدینە مرد. وتاری یەكەم راسترە.

## روداوەكانی ساڵی بیست و دوەمی كۆچی(٦٤٣ زایینی)

لەم ساڵەدا ئازەربایەجان دەستی بەسەرداگیرا. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٣٩/١٨ زایینی دوای دەست بەسەرداگرتنی هەمەدان و رەی و گورگان دەستی بەسەرداگیرا. ئێمە سەرەتا ئاماژە بەدەست بەسەرداگرتنی ئەم شارانە دەدەین و دواتر ئازەربایەجان.

## دەست بەسەرداگرتنەوەی دوبارەی هەمەدان

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەنوعەیم کوڕی موقەرەن بەرەو هەمەدان رۆشت و دەستی بەسەرداگرت و قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەم کارەدا هاوکاری کرد. کاتێك ئەم دوانە لەوێ گەڕانەوە، خەڵك لەگەڵ خوسرەو شەنوم دوبارە لەدین هەڵگەرانەوە. کاتێك فەرمانی عومەر کوڕی خەتاب بەنوعەیم کوڕی موقەرەن گەیشت، ماڵئاوایی لەحوزەیفە کوڕی یەمان کرد و بەرەو هەمەدان بەرێکەوت و حوزەیفە گەڕایەوە بۆ بازاری کوفە. نوعەیم کوڕی موقەرەن بەسوپایەکی ئامادە بۆ شەڕ بەرەو هەمەدان رۆیشت و دەستی بەسەر هەمو شارەکانی ئەو ناوچەیە گرت و گەمارۆی خستنەسەر. کاتێك خەڵك ئەمەیان بینی، خوازیاری ئاشتی بون و نوعەیم ئاشتی لەگەڵ بەستن و باجی لەوان وەرگرت. دەستەیەك دەڵێن: دەست بەسەرداگرتنی لەساڵی ٦٤٥/٢٤ زایینی شەش مانگ دوای کوژرانی عومەر رویدا. لەم کاتەدا کەنوعەیم کوڕی موقەرەن لەگەڵ دوانزەهەزار شەڕکەر لەهەمەدان بو، خەڵکی دەیلەم و رەی و ئازەربایەجان نامەیان بۆ یەك دەنوسی و (موتا) لەدەیلەم شۆڕشی دەست پێکرد و بەرێکەوت و لەروباری واج دابەزی. زەینەبی و ئەبو فەرخان لەگەڵ خەڵکانی رەی گەیشتن و ئیسفەندیار برای رۆستەم لەئازەربایەجان. ئەمانە لەدەوری یەك کۆبونەوە و فەرماندەی پادگان و پێگە سنوریەکان لەترسی ئەوان خۆیان لەنان قەڵاکانیان حەشاردا و ئەم هەواڵەیان بۆ نوعەیم کوڕی موقەرەن نارد. ئەو یەزید کوڕی قەیسی هەمەدانی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و روبەروی ئەوان بویەوە. دو سوپا لەروباری واج بۆ شەڕی یەك ریزیان بەست. شەڕێکی قورس و دژوار رویدا. ئەمە لەخۆیدا شەڕێکی دژوار بو کەبەرابەری شەڕی نەهاوەندی دەکرد. ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و موسوڵمانان تا ئەو شوێنەی توانیان ئەوانیان کوشتار کرد. ئەوان کەسێکیان بۆ لای عومەر رەوانە کرد. عومەر فەرمانی بەنوعەیم کوڕی موقەرەن دا بەرەو رەی بڕوات و لەگەڵ خەڵکانی ئەو

ناوچەیە شەڕ دەست پێبکات و دوای گرتن لەوێ بمێنێتەوە. دەستەیەك دەڵێن: موغەیرە کوڕی شەعبە، فەرمانداری کوفە، جەریر کوڕی عەبداللەی رەوانەی هەمەدان کرد تا شەڕی خەڵکانی ئەو ناوچەیە بکات کەچاوێکیان بەتیر کوێر کرد. عەبداللە وتی: ئەوە وەك تاقی کردنەوەیەکی خوایی هەژمار دەکەم کەتا هەر کاتێك ویستی، روخساری منی پێ رازاندەوە و دونیایی بۆ من روناك کرد و سەرئەنجام لەرێگەی خۆیدا لەمنی سەندەوە. دواتر لەسەر بنەمای ئاشتی نەهاوەند دەستی بەسەر هەمەداندا گرت و سەرزەمینەکانی دەوروبەری بەزۆر گرت. دەستەیەك دەڵێن: گرتنی ئەو شارە لەسەر دەستی موغەیرە کوڕی شەعبە ئەنجام درا و جەریر فەرماندەی پێشەنگەکانی بو. هەروەها دەڵێن: قەرەزە کوڕی کەعبی ئەنساری دەستی بەسەردا گرت.

## گرتنی قەزوێن و زەنجان

دوای ئەوەی موغەیرە کوڕی شەعبە جەریر کوڕی عەبداللەی بۆ هەمەدان نارد و دەستی بەسەرداگرت، بەرائ کوڕی عازەبی بەسوپایەك بەرەو قەزوێن نارد و فەرمانی پێدا بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوێت وئەگەر دەستی بەسەردا گرت، لەوێوە هێرش بکاتە سەر دەیلەمیەکان و شەڕ لەگەڵ ئەوان دەست پێبکات. مەبەستی ئەوان شوێنێك لەنزیك دەستبی بو. بەرائ بەرێکەوت تاگەشتە ئەبهەر کەقەلایەکی بەهێزی بو. خەڵکەکەی شەریان کرد و دواتر داوای ئەمانیان کرد. بەرائ ئەمانی پێبەخشین و دواتر پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. دواتر رویکردە قەزوێن. کاتێ هەوالی ئەم روداوانە بەخەڵکی ئەو ناوچانە گەیشت، پەیك و پەیامیان بۆ لای دەیلمیەکان نارد و داوای هاوکاریان کرد و ئەمان مژدەی هاوکاریان پێدان. موسوڵمانان بەوان گەیشتن و ئەوان بۆ شەڕ هاتنەدەر و دەیلەمیەکان لەسەر بەرزایی کوێستانەکان وەستابون و هیچ کارێکیان نەدەکرد. کاتێ قەزوێنیەکان ئەمەیان بینی، لەسەر بنەمای ئاشتی ئەبهەر داوای ئاشتیان کرد. یەکێك لەموسوڵمانان وتی:

قد علم الديلم اذ تحارب     حتى اتى فى جيشه ابن عازب

بان ظن المشركين كاذب     فكم قطعنا فى دجى الغياهب

من جبل وعر ومن سباسب

یانی: دەیلەمیەکان لەکاتی شەڕ کردن، ئەو کاتەی لەشکرەکەی کوڕی عازەب گەیشتن، بەباشی دەیانزانی گومانەکانی بتپەرستەکان درۆ ئامێز و فریو دەرن. لەناو دڵی تاریك و ڕەشی شەوان، ئێمە کوێستانە دژوارەکانمان بڕی و بەبیابانەکاندا تێپەڕمان کرد.

بەرا کوڕی عازەب ئەوەندە لەگەڵ دیەلەیەکان شەڕی کرد تا بۆدانی باج و سەرانە ناچاری کردن. ئەو هێرشی کردە سەر گیلان و تەلیسان و زەنجانی بەزۆر گرت. کاتێك وەلید کوڕی عەقەبە بو بەفەرمانداری کوفە، بۆ شەڕی دەیلەم و گیلان و موغان و بەبر و تەلیسان ڕۆشتەدەر و گەڕایەوە.

## دەست بەسەرداگرتنی ڕەی

دواتر نوعەیم کوڕی موقەرەن لەروباری واج بەرێکەوت تا گەیشتە ڕەی و زەینەبی و ئەبو فەرخان لەری هاتنەدەر. ئەو روبەروی نوعەیم بویەوە و داوای ئاشتی کرد و سازگاری خۆی ودوژمنایەتی لەگەڵ پاشا ئاشکرا کرد. پاشاکەیان سیاوەخش کوڕی مێهران کوڕی بەهرامی چوبین بو. سیاوەخش داوای هاوکاری لەخەڵکی دونباوەند و تەبەرستان و قومس و گورگان کرد و ئەوان لەترسی موسوڵمانان هاوکاریان کرد. لەداوێنی کوێستانی ڕەی و لەکەنار شارەکانی روبەروی موسوڵمانەکان بونەوە و بۆ شەڕ کردن دژی ئەوان ریزیان بەست. زەینەبی بەنوعەیم کوڕی موقەرەنی وتبو: لەبەرچاوی ئەوان ئێوە زۆرن و ئێوە کەمن. دەستەیەك لەسوارەکان لەگەڵ مندا ڕەوانە بکە تا لەشوێنێکەوە کەنەزانن هێرش بکەمە سەر شارەکەی ئەوان و لەناویان بەرم. تۆیش روبەروی ئەوان ببەرەوە. کاتێك ئێمە هێرشیان بکەینە سەر، ناتوانن خۆڕاگری بکەن. نوعەیم شەوانە چەندین سواری بەسەرکردایەتی کوڕی براکەی مونزەر کوڕی عەمرۆ رەوانە کرد. زەینەبی ئەوانی بردە ناوشار و خەڵك لەم کارە ئاگادار نەبون. ئەو، شەوانە هێرشی کردەسەریان و لەسەرقاڵ بون بەکاروباری شارەکەیان دوری خستنەوە. دانیشتوانی شار لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری و شەڕیان کرد تا ئەوەی بانگی تەکبیریان لەپشت سەری خۆیانەوە بیست و شکەستیان خوارد و لەو شارەدا کوشتار کران بەرادەیەك بۆ ژوماردنی کوژراوەکان بە قامیش دەست نیشانیان دەکردن. خواوەند

لەشارەکانی ڕەی بەئەندازەی مەداین تالآنی بەموسوڵمانان بەخشی و زەینەبی لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی ڕەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و نوعەیم کوڕی موقەرەن ئەوی کردە سنورداری ئەوان. دوای ئەوە بەردەوام گەورەیی لەڕەی لەبنەماڵەی زەینەبی بو. نوعەیم شارەکەی ئەوانی وێران کرد و لەبەر ئەمە پێی دەڵێن ( شاری کۆنە). زەینەبی فەرمانیدا بناغەی تازەی شاری ڕەی دابڕێژن. نوعەیم هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عومەر نوسی و پێنج یەکی ڕەوانە کرد. ئەو کەسەی هەواڵەکەی بۆ عومەر برد، موزاریبی عیجلی بو. مەضمەغان سەبارەت بەئاشتی پەیك و پەیامی بۆ لای نوعەیم کوڕی موقەرەن ڕەوانە کرد تا شتێك بدات و دونباوەند ڕزگار بکات. نوعەیم ڕازی بو.

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی ڕەی لەسەر دەستی قەرەزە کوڕی کەعب بو. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی١٢/٦٤٢ دەستی بەسەردا گیرا. ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە و خوا زاناترە.

## گرتنی قومس و گورگان و تەبەرستان

کاتێك نوعەیم هەواڵی سەرکەوتنەکانی لەگەڵ پێنج یەکەکان بۆ عومەر ڕەوانە کرد، عومەر نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا براکەی سوەید کوڕی موقەرەن لەگەڵ هند کوڕی عەمرۆ جەمەلی و کەسانیتر بەرەو قومس ڕەوانە بکات. سوەید بەرەو قومس بەرێکەوت بەلآك کەس لەبەرابەر ئەو شەڕ و بەرگری نەکرد و ئەم شارەی بەشێوەیەکی ئاشتیانە گرت و تیایدا ئوردوی لێدا. ئەوانەی بۆ تەبەرستان ڕایان کردبو و ئەوانەی رویان کردبوە بیابان، دەستیان بەنامە نوسین کرد. سوەید بەپێشنیاری ئاشتی ئەوان ڕازی بو و باجی لەسەر ئەوان دیاری کرد و پەیمانێکی لەمبارەوە بۆ ئەوان نوسی. دواتر سوەید بەرەو گورگان بەرێکەوت و لەبەستام ئوردوی لێدا و بۆ پاشاکەی گورگان، زەرنان صول، نامەی نوسی. زەرنان صول لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی گورگان و دانی باج و بەرگری کردن لەم شارە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. ئەو خوازیاری ئەوە بو ئەگەر دوژمنان هێرشی بکەنەسەر، سوەید پارێزگاری و هاوکاریان بکات و سوەید بەم داوایە ڕازی بو. پێش ئەوەی سوەید بڕواتە ناو گورگان، زەرنان صول پێشوازی لێکرد. سوەید

هاورێ لەگەڵ ئەو رۆشتە ناو شار و لەوێ ئوردوی لێدا تا زەرنان صول باج و سەرانە کۆبکاتەوە و تەسلیمی بکات. دواتر زەرنان صول ئەو شوێنانەی مەترسیان لەسەر بو، بەسوەیدی نیشاندا و سوەیدیش تورکی دێهاتەکانی لەوێ جێگیر کرد. باجی لەسەر ئەو کەسانەی پاسەوانیان لەکەسانی دیکە دەکرد، هەلگرت.

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی ئەو شارە لەساڵی ٦٣٩/١٨ زایینی یا ساڵی ٦٥٠/٣٠ زایینی لەسەردەمی خەلافەتی عوسمان رویدا.

دەڵێن: ئیسپەهبۆد خاوەنی تەبەرستان بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی نامەیەکی بۆ سوەید نوسی تا شێوەی سازان بگرنەبەر و ئەو شتێك بەسوەید بدات. سوەید بەمە رازی بو و لەمبارەوە نامەیەکی بۆ نوسی.

## گرتنی تەرابلسی رۆژئاوا و بەرقە

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عاص لەمیسرەوە بەرەو بەرقە بەرێکەوت و خەڵکەکەی لەسەر ئەم بنەمایە پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست کەباج بدەن و هەرکام لەکوڕەکانی خۆیان کەبیانەوێت، بیفرۆشن. کاتێك لەکاری بەرقە تەواو بو، بەرەو تەرابلس بەرێکەوت و بۆ ماوەی یەك مانگ گەمارۆیدا بەلام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت. ئەو لەرۆژهەلاتی ئەم شارە دابەزیبو. لەم کاتەدا پیاوێك لەبەنی مەدلەج لەگەڵ حەوت کەس بەمەبەستی راو کردن رۆشتنەدەر و رێگەی رۆژئاوایی شارەکەیان گرتەبەر. کاتێك گەڕانەوە، گەرمی هەوا ئەوانی بێزار کردبو و لەسەر کەنارەکانی دەریا بەرێکەوتن. دیواری شارەکە پەیوەستی دەریا نەبو و کەشتیەکانی رۆم لەلەنگەرگەکان لەبەرابەر ماڵەکانی ئەوان لەنگەریان گرتبو. مەدلەجی و هاورێکانی رێگەیەکیان لەدەریاوە بۆ ناو شار بینی ورۆشتنە ناو شار و تەکبیریان وت. رۆمیەکان جگە لەکەشتیەکانی خۆیان پەناگەیەکیان نەبینی چونکە گومانیان دەکرد موسوڵمانان هێرشیان کردۆتە ناوشار. عەمرۆ کوڕی عاص و هاورێکانی سەیریان کرد و شمشێر دەرکێشراوەکانیان لەناو شاردا بینی و دەنگی هاواریان بیست. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی کرد و رۆشتە ناو شارەکەی ئەوان. رۆمیەکان تەنیا توانیان بارە سوکەکانی خۆیان هەڵبگرن و رابکەن و پەنا بۆ کەشتیەکانی خۆیان ببەن.

کاتێك عەمرۆ کوڕی عاص لەتەرابلس دابەزی، خەڵکی قەڵای سەبرە لەناو قەڵاکەدا خۆیان حەشاردا و لەبەر ئەوەی بەباشی بەرگری و پارێزگاریان لەخۆیان کرد، لەئەماندا بون و ئارامیان گرت. بەڵام کاتێك تەرابلس دەستی بەسەرداگیرا، عەمرۆ سوپایەکی رازاندەوە و بەرەو سەبرە رەوانەی کرد. ئەوان لەکاتی بەرەبەیان هێرشیان کردە سەر و بینیان خەڵکەکەی دەرگاکانیان کردۆتەوە و مەڕوماڵاتەکەی خۆیان بۆ لەوەڕین بردۆتەدەر چونکە هێشتا هەواڵی تەرابلس بەوان نەگەیشتبو. موسوڵمانان هێرشیان کرد و بەزۆر ڕۆشتنە ناو شارەکە و ئەوەی لەشارەکەدا بو، وەك تاڵانی هەڵیانگرت و بۆ لای عەمرۆ گەڕانەوە. دواتر عەمرۆ کوڕی عاص بەرەو بەرقە بەرێکەوت کەخەڵکی لەواتە لەبەربەریەکان لەوێ نیشتەجێ بون.

هۆکاری بەرێکەوتنی بەربەڕیەکان و کەسانیتر بەرەو رۆژئاوا ئەوە بو کەئەوان لەپانتاییەکانی فەلەستین لەوڵاتی شام و پاشاکەیان جالوت بو. کاتێك جالوت کوژرا، بەڕبەڕیەکان لەفەلەستینەوە بەرێکەوتن و رێگەی رۆژئاوایان گرتەبەر تا گەشتنە لوبیە و مەراتیە (دوشار لەشارەکانی میسری رۆژئاوا). خەڵکی زەناتە و مەغیلە، دو هۆز لەبەربەریەکان، بەرەو رۆژئاوا بەرێکەوتن و لەکوێستانەکاندا مانەوە وخەڵکی لەواتە لەسەرزەمینی بەرەقە جێگیر بون. ئەو شوێنەیان لەرۆژگاری باستان بە ئەنتابلس ناودەبرد. ئەوان بڵاو بونەوە تا گەیشتنە سوس. خەڵکی هەوار لەشاری لبدە دابەزین و خەڵکی نفوسە لەشاری سەبرە. چونکە رۆمیەکان لەوێ کۆچیان کرد و ئەفریقاییەکان کەنۆکەری رۆمیەکان بون، لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتیان بەست کەهەر کەس بەسەر وڵاتەکەیان زاڵبو، باجی پێبدەن. عەمرۆ کوڕی عاص، بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا، بەرەو ئەم ناوچەیە بەرێکەوت و خەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی سیانزە هەزار دینار وەك باج، پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست و مەرجیان دانا تا هەر کام لەمناڵەکانی خۆیان کەبیانەوێت، وەك بەشێك لەباج بیدەن و بیفرۆشن (؟)

## گرتنی ئازەربایەجان

دەڵێت: کاتێك موعەیم کوڕی موقەرن دەستی بەسەر رەی دا گرت، سیماك کوڕی خەرەشەی ئەنساری، بەهاوکاری بوکەیر کوڕی عەبدالله بۆ ئازەربایەجان رەوانە کرد.

عومەر ئەم فەرمانەی پێدا. سیماك ڕۆشتەی لای بوكەیر. كاتێك بوكەیر بەرەو ئەم ناوچەیە بەرێكەوت، ڕێگەی بڕی تا گەیشتە كوێستانەكانی جەرمیزان و لەم شوێنە ئیسفەندیار كوڕی فەروخزاد كە، لەڕوباری واج هەلاتبو، ڕوبەڕوی بویەوە. ئەمە یەكەم شەڕ بو لەئازەربایەجان یەخەی گرت. ئێرانیەكان شكەستیان خوارد و بوكەیر ئیسفەندیاری بەئەسیری گرت. ئیسفەندیار پێی وت: خوازیاری ئاشتیت یا شەڕ؟ بوكەیر وتی: ئاشتی. ئیسفەندیار وتی: من لای خۆت ڕاگرە كەئەگەر من بەرەو ئازەربایەجان نەڕۆم و یا بەنوێنەرایەتی خەڵكانی ئەوێ پەیمانی ئاشتی نەبەستم، لەبەردەم تۆدا خۆڕاگری ناكەن بەڵكو بۆ پەنا بۆ كوێستانەكانی دەوروبەر دەبەن و هەر كەس لەناو قەلاَكاندا بێت، بۆ ماوەیەك لەناو قەلاَكاندا خۆی حەشار دەدات. بوكەیر، ئیسفەندیاری لای خۆی ڕاگرت و دەستی بەسەر هەمو سەرزەمینەكاندا گرت مەگەر ئەوەی قەلاَكانی بەهێز بون. دواتر سیماك كوڕی خەرەشە لەگەڵ سوپاكەی خۆی بۆ هاوكاری كردنی گەیشت و بینی ئەو دەستی بەسەر ناوچەكانی دەوروبەری خۆی گرتوە. عەتەبە كوڕی فەرقەدیش دەستی بەسەر سەرزەمینەكانی دەوروبەری خۆی گرتبو.

بوكەیر كوڕی عەبدالله نامەی بۆ عومەر نوسی و داوای فەرمانی پێشڕەوی لێكرد. عومەر فەرمانی پێدا تا پانتاییەكانی باب پێشڕەوی بكات و كەسێك بكاتە جێگری خۆی لەسەرزەمینە دەست بەسەرداگیراوەكان. بوكەیر عەتەبە كوڕی فەرقەدی كردە جێگری خۆی و عەتەبەیش سیماك كوڕی خەرەشەی كردە لێپرسراوی ئەو سەرزەمینانەی كەبوكەیر كوڕی عەبدالله دەستی بەسەردا گرتبو. عومەر سەراسەری ئازەربایەجانی بەعەتەبە كوڕی فەرقەد سپارد.

بەهرام كوڕی فەروخزاد لەگەڵ سوپاكەی خۆی ئاهەنگی عەتەبەی كرد و لەسەر ڕێگاكەی كەمینی كرد تا عەتەبە گەیشت. لەم ناوەدا شەڕێكی قورس ڕویدا و بەهرام شكەستی خوارد. كاتێك ئەم هەواڵە بەگوێی ئیسفەندیار گەیشت ( و ئەو لەبەندی بوكەیر گرفتار بو)وتی: ئێستاكە ئاشتی سەقامگیر و ئاگر شەڕ ڕوی لەكوژانەوە كرد. دواتر لەگەڵ ئەو پەیمانی ئاشتی بەست و خەڵكی ئازەربایەجان* هەموی پەیمانەكەیان پشت ڕاست كردەوە. ئازەربایەجان بەشێوەیەكی ئاشتی خوازانە كەوتە دەست موسوڵمانەكان. بوكەیر وعەتەبە هەواڵی ئەم سەركەوتنەیان بۆ عومەر نوسی و پێنج

یەکەکانیان بۆ رەوانە کرد. کاتێك عومەر ناوچەکانی فەرمانڕەوایی بوکەیری بەعەتەبە سپارد، پەیمانی ئاشتی بۆخەڵکی ئازەربایەجان نوسی.

هەروەها لەم ساڵەدا عەتەبە هاوڕێ لەگەڵ دیاریەك کەبۆی هێنرابو، رۆشتە لای عومەر. عومەر ساڵانە کارگوزارەکانی خۆی بۆ ئایینی حەج بانگێشت دەکرد و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردن و بەمشێوەیە رێگەی لەستەم و ستەمکاری دەگرت.

## گرتنی باب

گرتنی باب لەم ساڵەدا رویدا. عومەر ئەبوموسای ئەشعەری بۆ بەسرە و سەراقە کوڕی عەمرۆی (ناسراو بەناوی زوئەلنور) بەرەو باب رەوانە کردبو. ئەو عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی کەئەویش بەزئەلنور ناودەبرا، کردە فەرمانددەی پێشەنگەکانی سوپاکەی. لەسەر یەکێك لەدوباڵی چەپ وراستی سوپاکەی حوزەیفە کوڕی ئەسیدی غەفاری کردە فەرماندە و لەسەر باڵەکەی دیگە بوکەیر کوڕی عەبداللە ی لەیسی. بوکەیر پێش ئەوان خۆی گەیاندە پانتاییەکانی باب. بەرێوبەری دابەش کردنی تالآنیەکانی بە سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی سپارد. سەراقە بەرێکەوت و کاتێك لەئازەربایەجان هاتەدەر، بوکەیر گەیشتە ناوچەی باب. عومەر لەجەزیرەوە حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ هاوکاری سەراقە رەوانە کرد و زیاد کوڕی حەنزەلەی لەجیاتی ئەودانا بو. کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە گەیشتە باب، شەهریار ، پاشای بابی لەوێ بینی. ئەو لەبنەماڵەی ئەو شەهریارە بو کەبەنی ئیسرائیلی فریودا و لەگەڵ ئەوان هێرشی کردە سەر شام. شەهریار نامەی بۆ نوسی و داوای ئەمانی کرد تا بڕواتە لای. عەبدولرەحمان ئەمانی دا. ئەو هاتە لای عەبدولرەحمان و وتی: من لەبەرابەر دوژمنێکی سەگسکار و تیرە و خێڵە ناسازگار و جۆراوجۆرەکانم کەنەژاد و خوێنێکی گرانباییان نیە و شیاو نیە بۆ خەڵکانی خاوەن بنەماڵە و بیرمەند لەوان لەبەرابەر بنەماڵەدارەکان پشتیوانی بکات. من هیچ خزمایەتیەکەم لەگەڵ خەڵکانی قبج (کوێستانەکانی قبق) و ئەرمەنیەکان نیە. ئێوە بەسەر خەڵکان و ولآتی مندا زاڵبون. کەواتە من لەئێوەم و دەستم لەناو دەستی ئێوەدایە و باجم لەبەر دەستی ئێوە و هاوکاری من تایبەتە بەئێوە و لێپرسراوم لەوەی دەتانەوێت، ئەنجامی بدەم. داواتان لێدەکەم ریسوایی باج بەسەر ئێمەدا نەسەپێنن تا

لەبەرابەر دوژمنانتان ریسوا نەبین.

دەڵێت: عەبدولرەحمان بۆ لای سەراقە رەوانە کرد کەهەمان وتاری دوبارە کردەوە و سەراقە کوڕی عەمرۆ پێی رازی بو. ئەو زیادی کرد کەهیچ رێگایەك بۆ نەدانی باج نیە و ئەمە تەنیا بۆ ئەو کەسانەیە بمێننەوە و شەڕ نەکەن. شەهریار پێی رازی بو. سەراقە چۆنیەتی ئەم کارەی بۆ عومەر نوسی و عومەر کارەکەی بەرەوا زانی و پشت راستی کردەوە.

## دەست بەسەرداگرتنی موغان

کاتێك سەراقە کوڕی عەمرۆ کاری بابی تەواو کرد، بوکەیر کوڕی عەبداللە و حەبیب کوڕی موسلیمە و حوزەیفە کوڕی ئەسید و سەلمان کوڕی رەبیعەی بەرەو کوێستانەکانی دەوروبەری ئەرمەنستان رەوانە کرد. ئەو بوکەیری بۆ موغان، حەبیبی بۆ تفلیس، حوزەیفەی بۆ کوێستانەکانی لان(ئالان) و سەلمانی بۆ ناوچەکانی دیکە نارد. سەراقە هەواڵی سەرەکەوتنەکانی بۆ عومەر نوسی و ئاگاداری کردەوە کەئەو کەسانەی بۆ ئەم ناوچانە رەوانەکردوە. عومەر روبەروی کارێکی دژوار بویەوە کەتەنیا بەرەنج و خەرجی زۆر گومانی کۆتایی هاتنی لێدەکرا چونکە ناوچەیەکی بەربلاو و پێویستی بەسوپایەکی گەورە بو. کاتێك سوپای ئیسلام کارەکانیان تەواو کرد وئیسلامیان سەقامگیر و دادپەروەریان بلاو کردەوە، سەراقە کوڕی عەمرۆ مرد. ئەو پێش مردن، عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی وەك جێگری خۆی دەست نیشان کرد. هیچ کام لەفەرماندەکان نەیانتوانی دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرن جگە لەبوکەیر کوڕی عەبداللە کەتوانی خەڵکانی موغان تێکبشکێنێت و دواتر خەڵکەکەی هاتنە لای و بەدانی باج رازی بون: بۆ هەر پیاوێکی باڵغ دینارێك.

گرتنی موغان لەساڵی ٦٤٢/٢١ زایینی رویدا. کاتێك هەواڵی مردنی سەراقە کوڕی عەمرۆ بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت و ئاگادار بویەوە کەئەو عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی وەك جێگری خۆی دیاری کردوە، فەرمانڕەوایی عەبدولرەحمانی لەسەر باب بەهێزتر کرد و بۆ شەڕ دژی تورکان دەست نیشانی کرد.

شەڕ لەگەڵ تورکان

کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە فەرمانی پێدرا بۆ شەڕی تورکان رەوانە ببێت، خەڵکی بەرێخست تا لەباب تێپەڕین. شەهریار پێی وت: دەتەوێت چی بکەیت؟ وتی: دەمەوێت بۆ شەڕی بەلەنجەریەکان و تورکەکان بڕۆم. شەهریار وتی: ئێمە لەوان بەمە رازین کەئارامی ئێمە لەم لای باب دەپارێزن و ئازارمان نادەن. عەبدولرەحمان وتی: بەڵام ئێمە تەنیا بەوە رازی دەبین کە لەگەڵ ئەوان لەناو سەرزەمینەکانی خۆیان شەڕ بکەین. سوێند بەخوا خەڵکانێك هاورێیەتیمان دەکەن ئەگەر فەرمانڕەواکەیان فەرمان بدات لەقولاییەکاندا بڕۆنە پێش، تا ناو سەرزەمینی رۆم دەیانبەم. شەهریار وتی: ئەوانە کێن؟ عەبدولرەحمان وتی: خەڵکانێکن هاورێی پێغەمبەر(ص) خوا بون و ئاگایانە بەم کارە هەستاون. ئەم کارە بەردەوام لەدەستی ئەواندا دەبێت و سەرکەوتن بەردەوام هاورێیەتیان دەکات تا کەسانیتر بێن و بەسەر ئەواندا زاڵبن و ناخی ئەوان بگۆڕن و ئەوانیش هەڵس و کەوت و کردارەکانی خۆیان بگۆڕن. لەرۆژگاری عومەر چەندین شەرکەر لەگەڵ بەلەنجەریەکان شەڕیان کرد. ئەوان وتیان: ئەو بەسەر ئێمەدا زاڵ نەبو مەگەر بەهاوکاری فریشتەکان کەئەوانیان لەمردن دەپاراست. بەلەنجەریەکان هەڵاتن و لەناو قەڵاکاندا خۆیان داشارد. ئەوسەرکەوتوانە گەڕایەوە و تاڵانیەکانی لەگەڵ خۆی هێنا. سوارەکانی ئەو گەیشتنە قولاییەکانی (بیضاء) کەدوسەد فەرسەخ لەبەلەنجەرەوە دوور بو. گەڕانەوە بێ ئەوەی یەك کەس لەوان کوژرا بێت.

دواتر ئەو لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەففان بۆ شەڕی ئەوان رۆشتەدەر و هاوشێوەی رابردو بەسەر ئەواندا زاڵبویەوە تا ئەوەی خەڵکانی کوفە کردارەکانی خۆیان گۆڕی چونکە عوسمان کەسانێکی دەکردە فەرمانڕەوایی ئەوان کەلەدین هەڵگەرابونەوە، بەردەوام دەیویست چاکسازی لەبارودۆخی ئەواندا بکات بەڵام روتی بەفیڕۆچونی ئەوانی خێراتر کرد. دوای ئەوە عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە بۆ شەڕ رۆشتەدەر بەڵام تورکان یەکیان بۆ شەڕێکی ئازایانە هاندا و لەدارستانەکاندا کۆبونەوە. لەم کاتەدا پیاوێك لەوان تیرێکی بۆ یەکێك لەموسوڵمانەکان هاویشت و بەشێوەیەکی لەناکاو کوشتی. هاورێکانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد و لەم کاتەدا تورکان هاتنەدەر و شەڕیان دەست پێکرد و شەڕەکە روی لەدژواری کرد. هاوارکەرێك لەئاسمانەوە هاواری کرد: خۆڕاگری ئەی عەبدولرەحمان کەجێگەی ئێوە بەهەشتە. عەبدولرەحمان ئەوەندە شەڕی کرد تا کوژرا

و هاورێکانی بلاوەیان لێکرد. براکەی سەلمان کوڕی رەبیعە ئالاکەی هەلگرت و شەڕی دەست پێکرد. هاوارکەرێك لەئاسمانەوە هاواری کرد: خۆڕاگری بکەن ئەی بنەمالەی عەبدولرەحمان! سەلمان لەوەلامدا وتی: ئایا بێ ئۆقرەیی و ترس لەمندا دەبینیت؟ سەلمان هاورێ لەگەلْ ئەبو هورەیرەی دوسی خەلکی بردەدەر و ئەوانی لەگیلانەوە برد و بەرەو گورگان رۆیشتن. ئەم گرفتاریە نەبوە رێگری لەوەی جەستەی عەبدولرەحمان لەگەلْ خۆیان ببەن و بۆ سەرزەمینەکەی خۆی بگەڕێننەوە کەتا ئێستایش داوای باشبونەوە و بەختەوەری لێدەکەن.

## دابەش کردنی سەرزەمینە دەست بەسەرداگیراوەکان لەنێوان خەلکانی کوفە و بەسرە

لەم سالەدا عومەر ئەو سەرزەمینانەی لەسەر دەستی خەلکانی کوفە و بەسرەوە دەستیان بەسەرداگیرابو، بەشێوەیەکی بەرابەر لەنێوان ئەواندا دابەشی کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کەعومەر کوڕی سەراقە نامەی بۆ عومەری کوڕی خەتاب نوسی و ئاگاداری کردەوە کەژمارەی خەلکی بەسرە زیادی کردوە و ئەو باجانەی بەم سەرزەمینە دەگات، بەشی ئەوان ناکات. ئەو داوای لەعومەر کرد باجی یەکێك لەدوشارەکانی (ماە) تایبەت بکات بەوان یا ماسەبزان بەوان بسپێرێت. هەوالی ئەم کارە بەخەلکی کوفە گەیشت و ئەوان بەفەرمانڕەواکەیان وت: نامە بۆ عومەر بنوسە و ئاگاداری بکەرەوە کە رامهورموز و ئیزەج هی ئێمەیە نەك بەسریەکان چونکە لەگرتنی ئەم شارە نەهاوکاریان کردین و نەهاتنە لامان تا خۆمان دەستمان بەسەرداگرتن. عەمار ئەم کارەی نەکرد. عەتارد پێی وت: ئەی کۆیلەی لوت بڕاو، کەواتە بەشی ئێمە لەسەر چ بنەمایەك دەدەیت. بۆ باجی ئێمە بەکسانیتر دەسپێریت؟ عەماری یاسر وتی: لەنێوان دوگوێچکەم، ئەوەی کەزیاترم خۆش دەویست، جوێنت پێدا (شانازی دەکەم کەکۆیلەیەکی لوت بڕاو بم بەلام وەك تۆ دز و جەردە نەبم)لەبەر ئەمە خەلکانی کوفە رقی ئەویان لەدلْ گرت. دوای ئەوە خەلکانی کوفە و بەسرە شەڕیان دەست پێکرد. خەلکی بەسرە خوازیاری دێهاتێك بون لەدوریەکی کەم لەئیسفەهان کەئەبو موسای ئەشعەری دەستی بەسەردا گرتبو و ئەمە لەکاتێکدا بو عومەر کوڕی خەتاب ئەوی بۆ

هاوکاری خەڵکی کوفە رەوانە کردبو. کوفیەکان پێیان وت: ئێوە بۆ هاوکاری ئێمە هاتن و ئێمە دەستمان بەسەر شارەکاندا گرت، لەبەر ئەمە ئەوانەی ئەمانیان پێدراوە و ئەم سەرزەمینانە تایبەتن بەئێمە. عومەر وتی: راست دەکەن. شەڕکەرانی پێش و دوای شەڕی قادسیە کە لەبەسرە نیشتەجێ ببون، وتیان: ئەگەر بەم شێوەیە، دەبێت بەشی ئێمە لەوەی لەگەڵ ئێوەدا شەریکین، بدەن (وەك سواد و سەرزەمینەکانی دەوربەری). .

عومەر ئیزنی لەخەڵکی کوفە وەرگرت و سەد دیناری بەوان بەخشی. ئەم سەد دینارە بەو کەسانەدرا کە لەشەڕەکانی پێش قادسیە و دوای قادسیە شەڕیان کردبو.

کاتێك معاویە هاتە سەرکار(ئەو بو لەرۆژگاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەناو ئەو کەسانەی لەبەسرە و کوفە دەهاتنە لای، قێنسرینی بەساز وبەرگی شەڕ و سوپا تەیار کرد) بەشی ئەوانی لەگرتنی ولآتەکانی عێراق و ئازەربایەجان و موسڵ و باب وەرگرت چونکە ئەوانە لەسەر دەستی خەڵکانی کوفە گیرابون. قێنسرین یەکێك لەدێهاتەکانی حمص بو. خەڵکانی موسڵ و جەزیرە لەم کاتەدا گەشتیار بون و هەمو ئەو کەسانەی لەخەڵکی ئەم دوشارە لەرۆژگاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب، لەشوێنی کۆچ پێکردنی خۆیان نیشتەجێ ببون، گەڕانەوە قێنسرین. لەبەر ئەمە معاویە بەشێکی بەوان بەخشی.

خەڵکی ئەرمەنستان لەسەردەمی معاویە، لەدین هەڵگەڕانەوە. معاویە حەبیب کوڕی موسلیمەی لەباب دانابو و حەبیب لەم کاتەدا لەجورزان بەسەری دەبرد. ئەو لەجورزان بۆ خەڵکی تفلیس و کوێستانەکانی دەوروبەری نامەی نوسی و ئەوان وەڵامی داخوازەکەی ئەویان دایەوە.

## لەسەر کار لابردنی عەمار کوڕی یاسر لەکوفە

## فەرمانداری ئەبوموسای ئەشعەری و موغەیرە کوڕی شەعبە

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب عەمار کوڕی یاسری لەفەرمانڕەوایەتی کوفە هەڵگرت و ئەبو موسای ئەشعەری لەجێگەی دانا. هۆکارەکەی ئەوەبو خەڵکی کوفە لای عومەر گلەییان لێکرد و وتیان: عەمار بۆ ئەم کارە گەورە شیاو نیە و توانایی راست و دروست ئەنجامدانی کارەکانی نیە. خەڵکی کوفە دژی ئەو راپەڕین و عومەر بانگی کرد. لەگەڵ ئەو دەستەیەك هاتنەدەر و وایان نیشان دەدا لەگەڵ ئەودان بەڵام ئەوان بۆ دوژمنایەتی کردنی لەو کەسانەی لەکوفە مابونەوە، خراپتر بون. وتیان: ئەو شیاو نیە و شارەزایی بەڕێوبردنی وڵات نیە و نازانێت ئەوت بۆچ کارێکی گرنگ دەستنیشان کردوە. یەکێك لەوان سەعد کوڕی مەسعودی سەقەفی مامی موختار بو و ئەویتریان جەریر کوڕی عەبدالله. ئەم دوانە دژی ئەو لای عومەر کوڕی خەتاب قسەیان کرد. عومەر ئەوی لەسەر کار لابرد و لێی پرسی: ئایا پێت ناخۆش بو لەسەر کار لابرای؟ وتی: ئەو کاتەی بۆ ئەم کارە دەست نیشان کرام، خۆشحاڵ نەبوم بەڵام کاتێك لەسەر کار لابرام، ناڕاحەت بوم. عومەر وتی: دەمزانی تۆ پیاوێکی بەئەزمون بۆ بەڕێوبردنی وڵات نیت بەڵام ئەم کارەم لەسەر بنەمای ئەم ئایەی قورئان کرد کەدەڵێت: دەمانەوێت بەو کەسانەی لەسەر زەوی زوڵمیان لێکراوە، بەخشینەکانمان ببەخشین و ئەوان بکەینە رێبەر و میرات هەڵگری کەسانیتر (قصص/٢٨/٥).

دواتر عومەر روی کردە کوفیەکان و وتی: کێتان دەوێت؟ وتیان: ئەبو موسای ئەشعەری. عومەر ئەبوموسای وەك فەرمانڕەوایی ئەوان دیاری کرد. یەك ساڵ وەك فەرمانڕەوایی ئەوان مایەوە و لەم کاتەدا کۆیلەکەی ئەو دەستی بەفرۆشتنی توێشوی چوارپێکان کرد. وەلید کوڕی عەبدشەمس و دەستەیەك، گلەییان بردە لای عومەر و وتیان: کۆیلەکەی ئەو لەسەر پردەکەی ئێمە سەرقاڵی بازرگانی کردنە. عومەر ئەوی لەکوفە هەڵگرت و کردی بەفەرمانڕەوایی بەسرە. عومەر کوڕی سەراقەی بۆ جەزیرە رەوانە کرد.

عومەر بەتەنیایی لەسوچێکی مزگەوت دانیشت و خەوی لێکەوت. موغەیرە کوڕی شەعبە لەسەر سەری وەستا و پاسەوانی کرد تا بەئاگا هاتەوە. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەم کارەم نەکرد تەنیا لەبەر ئەوە نەبێت کەکارێکی ناخۆش رویداوە. عومەر وتی: کام کارە ناخۆشترە لەوەی کەسەد هەزار کەس لەفەرمانڕەواکەی خۆیان

نارازی بن و ئەو لەوان رەنجابێت؟ کوفە لەم کاتەدا سەد هەزار پیاوی شەڕکەری بو.
هاوڕێکانی هاتنە لای و وتیان: تۆ کارت بەم کارانە چیە؟ وتی: خەڵکی کوفە منیان بێزار کردوە. عومەر لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد تا یەکێك بکاتە فەرمانڕەوایی ئەوان. وتی: چی دەڵێن بۆ پیاوێکی لاواز و دین پاك یا پیاوێکی بەهێز و قایمەکار؟ موغەیرە وتی: لاوازی دین پاك ئیسلامەکەی تەنیا بەکەڵکی خۆی دێت و لاوازیەکەی لەئەستۆی تۆدایە، بەلاّم بەهێزی قایمەکار، بەهێزیەکەی بۆ خۆیەتی و قایمەکاریەکەی بۆ موسوڵمانان. ئەو موغەیرە کوڕی شەعبەی کردە فەرمانڕەوایی کوفە. موغەیرە تامردنی عومەر وەك فەرمانڕەوایی کوفە مایەوە کەدوساڵ و چەند مانگێکی خایاند. کاتێك ئەوی رەوانە کرد وتی: دەبێت چاکەکان لەتۆ ئاسودەبن و خراپەکان لەتۆ ترسان. عومەر ویستی سەعد وەقاس بۆ سەر کارەکەی موغەیرە رەوانە بکات بەلاّم پێش ئەنجامدانی ئەم کارە کوژرا و تەنیا لەبەرژەوەندی ئەو پێشنیاری کرد.

## گرتنی خوراسان

بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا ئەحنەف کوڕی قەیس هێرشی کردە سەر خوراسان. دەستەیەك دەڵێن: ئەمە لەساڵی ٦٣٩/١٨ زایینی رویدا.
بەمشێوە بو کاتێك یەزدگێرد دوای شکانی جەلەولا هاتە رەی، ئەبان کوڕی جادویە فەرمانڕەوایی رەی، دژی راپەری و ئەسیری کرد. یەزدگێرد وتی: ئەی ئەبان، خیانەت لەمن دەکەیت؟ ئەبان وتی: نە، بەلاّم تۆ پاشایەتی خۆت بەجێهێشت و کەوتە دەست کەسانیتر و من ویستم تەنیا پێریستی ئەو شتانە بگرم کەلای منە. ئەو مۆرەکەی یەزدگێردی هەڵگرت و فەرمانی بەدەبیردا، پێرستی هەمو ئەو شتانە بگرێت کەخۆشی دەویست. دەبیر ئەو کارەی کرد و مۆری لێدا و مۆڕەکەی گەڕاندەوە. دواتر هاتە لای سەعد و هەمو ئەو شتانەی لەناو پێرستەکەدا بو، بەسەعدی سپارد. یەزدگێرد لەرەی بەرەو ئیسفەهان بەرێکەوت و لەوێوە بۆ کرمان و ئاگری پیرۆزی لەگەڵ خۆی دەبرد. دواتر ئاهەنگی خوراسانی کرد و رۆشتەمەرو. لەوێ دابەزی و ئاتەشکەدەیەکی دروست کرد و ئارام و ئاسودە بو بەو گومانەی کەس ئیتر ناکاتە سەری. ئەو ئێرانیانەی مابونەوە، فەرمانیان لێبرد. ئەو لەگەڵ هورموزان نامەیان بۆ یەك نوسی و ئێرانیەکانی

هاندا و ئەوان پەیمانی خۆیان لەگەڵ ئیسلامیەکان خستە ژێر پێ. هەروەها فیروزان و خەڵکی کوێستانەکان راپەڕین. ئەوانیش پەیمانی خۆیان شکاند. عومەر فەرمانی بەموسوڵمانانەدا پێشڕەوی بۆ قوڵایی خاکی ئێران بکەن. ئەحنەف لەتبسینەوە رۆشتە خوراسان و بەزۆر دەستی بەسەر هەراتدا گرت و صەحار کوڕی بەهمانی عەبدی وەك جێگری خۆی دیاری کرد. دواتر بەرەو مەروی شاجەهان بەرێکەوت و موتەرفە کوڕی عەبداللە کوڕی شەخیری رەوانەی نەیشابور کرد و حەرەس کوڕی حسانی بۆ سەرەخس. کاتێك ئەحنەف گەشتە نزیکی مەروی شاجەهان، یەزدگێردی بەجێهێشت وبەرەو مەروروود رۆشت و لەوێ دابەزی. ئەحنەف لەمەروی شاجەهان ئوردوی لێدا. یەزدگێرد لەمەرو رودەوە بۆ ختقان و پاشای سەغد و پاشای چین نامەی نوسی و داوای هاوکاری لێکردن. ئەحنەف کوڕی قەیس لەمەروی شاجەهان هاتەدەر و حارسە کوڕی نەعمانی باهلی وەك جێگری خۆی دیاری کرد و ئەمە دوای ئەوە بو کەهێزە یارمەتیدەرەکان لەکوفەوە گەشتنە لای ئەو. ئەحنەف بەرەو مەروروود بەرێکەوت.

کاتێك یەزدگێرد ئەمەی بیست، بەرەو بەلخ بەرێکەوت و ئەحنەف لەمەروروود دابەزی. خەڵکی کوفە هێرشیان کردە سەر یەزدگێرد و ئەحنەف بەدوای ئەواندا گەیشت. خەڵکی کوفە و یەزدگێرد لەبەلخ شەڕیان کرد. یەزدگێرد شکەستی خوارد ولەروباری تێپەڕی. ئەحنەف پەیوەستی خەڵکانی کوفە بو چونکە خوا سەرکەوتنی پێبەخشین. بەلخ لەو سەرزەمینانەیە لەسەر دەستی ئەوان گیرا.

خەڵکانی خوراسان بەردەوام دەڕۆیشتن، ئەوانەی هەڵاتبون و ئەوانەی پەیمانی ئاشتیان شکاندبو و ئەمە لەنەیشابور تا تەخارستانی دەگرتەوە. ئەحنەف کوڕی قەیس بۆ مەرورود گەڕایەوە و رەبعی کوڕی عامری کردە فەرمانڕەوایی تەخارستان. ئەحنەف هەواڵی سەرکەوتنی خۆی بۆ عومەر نوسی و ئەو وتی: حەزدەکەم لەنێوان ئێمە تا ئەوێ دەریایەك لەئاگر دەبو. عەلی وتی: بۆ ئەی سەروەری باوەڕداران؟ عومەر وتی: چونکە خەڵکەکەی سێ جار دێنەدەر و لەسێیەم جار لەناو دەچن و لای من ئەوە خۆشەویستترە لەوەی بەسەر موسوڵمانان دێت ( یا ئەم کارە لەسەر دەستی موسوڵمانان ئەنجام بدرێت).

عومەر بۆ حەنەفی نوسی تەنیا لەم لای روبارە بەسەندە بکات و لەروبار تێنەپەڕێت.

کاتێك یەزدگێرد تێکشکاو لەروبار تێپەڕی، خاقان لەگەڵ تورکان و سەغدیان و خەڵکانی

فەراغینە هاوکاریان کرد. یەزدگێرد و خاقان بۆ خوراسان گەڕانەوە و لەبەلخ دابەزیتن. خەڵکی کوفە رۆشتنە لای ئەحنەف لەمەرورود. ئێرانیەکانیش لەمەرو رۆشتنە لای.

کاتێك ئەحنەف ئاگادار بویەوە کەیەزدگێرد و خاقان لەروبار بەرەو لای ئەم پەڕیونەوە، شەوانە لەخێوەتەکەی خۆی هاتەدەر تا بگەڕێت و بزانێت ئایا وتەیەکی بەنرخ دەبیستێت تا کەڵکی لێوەربگرێت. لای دو پیاو تێپەڕی کەتوێشوی چوارپێکانیان پاك دەکردەوە. یەکیان بەویتری وت: خۆزگە فەرماندەکەمان ئێمەی بەم کێوە پشتگەرم و بەهێز دەکرد تا روبار لەنێوان ئێمە و دوژمنەکەمان وەك سەنگەرێك بێت و کێو لەپشت سەرمانەوە بێت تا لەپشتەوە هێرش نەکەنە سەرمان و تەنیا لەیەك بەرەدا شەڕ بکەین. ئەگەر بەم شێوە دەبو، هیوادار دەبوم کەخوا سەرکەوتن بەئێمە ببەخشێت. ئەحنەف گەڕایەوە، کاتێك بەیانی داهات، خەڵکی کۆکردەوە و ئەوانی بۆ داوێنی کێوەکە برد. لەخەڵکانی بەسرە دەهەزار پیاوی شەڕکەری لەگەڵدا بو و لەخەڵکانی کوفەیش بەهەمان شێوە. تورکان و هاورێکانیان هاتن و خێوەتیان هەڵدا. ئەوان بەرەبەیان تا ئێوارێ شەڕی موسوڵمانانیان دەکرد و ئێواران دەستیان لەشەڕ هەڵدەگرت و شەوانە لەبەرابەر ئەوان پاشەکشێیان دەکرد.

ئەحنەف شەوانە لەگەڵ پێشەنگەکانی سوپاکەی خۆی رۆشتەدەر و کاتێك گەیشتە نزیك لەشکری خاقان، دەستی لەپێشڕەوی هەلگرت. کاتێك روخساری بەرەبەیان دەستی بەدرەخشانەوە کرد، پیاوێکی تورك نەژاد لەخێوەتەکەی هاتەدەر کەگەردنبەندێکی لەملدابو. ئەو تەپڵی لێدا و لەشوێنێك لەناوەڕاستی دوسوپا داوای شەڕکەری کرد. ئەحنەف هێرشی کردە سەری و ئەم دوانە پەلاماری یەکیاندا. ئەحنەف پیاوی تورك نەژادی کوشت و گەردنبەندەکەی هەلگرت و هەستایە سەر پێ و داوای شەڕکەری کرد. پیاوێکی تورکی نەژادی دیکەهاتەدەر و کرداری هاورێکەی گرتەبەر. ئەحنەف هێرشی کردە سەر و ئەم دوانە دەستیان بەشەڕ کرد و سەرئەنجام ئەحنەف بەشمشێر لێیدا و کوشتی. ئەو گەردنبەندی تورکەکەی هەلگرت و هەستایە سەرپێ. تورکی سێیەم هاتەدەر و بەهەمان شێوەی دوکەسی پێشو هەڵس و کەوتی کرد. ئەحنەف هێرشی کردە سەر کوشتی و دواتر گەڕایەوە بۆ ناو سوپاکەی خۆی و بۆ شەڕ ئامادەی کرد.

شێوازی تورکەکان بەم چەشنە بو کەشەڕیان دەست پێنەدەکرد تا سیان لەپاڵەوانەکانی ئەوان بۆ شەڕ دەهاتنەدەر و تەپڵیان لێدەدا و شەڕی دەستەویەخەیان نمایشت دەکرد. ئەوان دوای هاتنەدەری سێیەم کەس شەڕیان دەست پێدەکرد. کاتێك ئەو شەوە بەدوای کوژرانی سێیەم کەس شەڕیان دەست پێکرد، لای پاڵەوانە سەربڕاوەکانی خۆیان تێپەڕین و خاقان گومانی خراپی کرد و ئەمەی بەشوم زانی و وتی: مانەوەی ئێمە زۆری خایاند و پاڵەوانە گەورەکانمان شەرابی مەرگیان نوشی. ئێمە لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەم خەڵکە هیچ سودێك نابەین. ئەوان گەڕانەوە. هەتاو گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان و موسوڵمانان کەسیان لەوان نەبینی. هەواڵیان پێگەیشت کەخاقان و تورکان بەرەو بەلخ بەرێکەوتون. یەزدگێرد خاقانی لەمەرورود روبەروی موسوڵمانان کردبویەوە و بۆ مەروشاجەهان گەڕابویەوە. حارسە کوڕی نەعمان و هاورێکانی خۆیان لەقەڵاکاندا حەشاردا و ئەو گەمارۆی خستە سەرئەوان و گەنجینەکانی خۆی لەوێ هێنایە دەر. خاقان لەبەلخ مابویەوە.

کاتێك یەزدگێرد گەنجینە گەورە و فراوانەکانی خۆی هێنایەدەر و ویستی پەیوەستی خاقان بێت، فارسەکان پێیان وت: دەتەوێت چی بکەیت؟ وتی: دەمەوێت پەیوەستی خاقان بم و رۆژگار لەگەڵ ئەو بەسەر بەرم یا لەچین بمێنمەوە. وتیان: ئەمە کارێکی نەشیاو و ناڕەوایە. ئێمە بۆ لای ئەم خەڵکە بگەڕێنەوە تا پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ ببەستین چونکە خەڵکانێکی بەئەمەك و دیندارن. دوژمنێك کەلەسەر لێواری سنورەکانمان لەلامان بێت، لەروانگەی وڵات بەرێوەبردنەوە باشترە لەدوژمنێك کە لەوڵاتەکەی خۆی فەرمانڕەوایەتی ئێمە دەکات و دین و ئەمەکداری نەبێت. ئەو بەداواکەی ئەوان رازی نەبو. ئێرانیەکان خۆیان لێ بەدور گرت و شەڕیان لەگەڵ کرد و هێزەکانی ئەویان تێکشکاند و دەستیان بەسەر گەنجینەکاندا گرت. یەزدگێرد هەڵات و پەیوەستی خاقان بو و لەروبار تێپەڕی و لەبەلخەوە بۆ فەرغانە رۆیشت. یەزدگێرد لە تورکستان مایەوە و هەمو ژیانی لەوێ بەسەر برد تا ئەوەی خوراسانیەکان لەسەردەمی عوسمانیەکان لەدین هەڵگەڕانەوە و دەستیان بەنامە نوسین بۆ ئەوان کرد کە لەجێگەی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

فارسەکان، دوای کۆچ کردنی یەزدگێرد، رۆشتنە لای ئەحنەف و گەنجینە و

سامانەکانیان پێ سپارد و بۆ وڵاتەکەی خۆیان گەڕانەوە و بینیان سامانی ئەوان لەهەر کاتێکی دیکە لەسەردەمی خوسرەوەکان زیاترە. ئێرانیەکان شەیدای فەرمانڕەوایی موسوڵمانان بون. هەر سوارەیەك لەشەڕ لەگەڵ یەزدگێرد بەئەندازەی شەڕی قادسیەی بەرکەوت. ئەحنەف بەرەو بەلخ بەرێکەوت و دوای رۆشتنی خاقان و تێپەڕینی لەروبار، لەوێ دابەزی و کوفیەکان لەچوار شارەکەی ئەوێ مانەوە. دواتر بۆ مەرورود گەڕایەوە و هەواڵی سەرکەوتن بەسەر خاقانی بۆ عومەر نوسی.

کاتێك خاقان و یەزدگێرد لەروبار تێپەڕین، روبەروی نێردراوی شای شاکان، یەزدگێرد بۆ لای پاشای چین بونەوە. پەیك ئەوانی ئاگادار کردەوە کەپاشای چین وتویەتی: تایبەتمەندی ئەم خەڵکانە بەمن بڵێن کەئێوەیان لەوڵاتەکەتان دەرپەڕاندوە چونکە بەردەوام باسی فراوانی و زۆر سوپاکەی خۆتان و کەمی ئەوان دەکەیت. خەڵکێکی ئاوا کەم ناتوانن بەسەر ژومارەیەکی زۆری وەك ئێوە سەرکەون مەگەر ئەوەی تایبەتمەندیەکی تایبەت لەناو ئەواندا بێت و زیانەکان لەناو ئێوەدا. پاشای چین پرسی: ئایا رێز لەپەیمانەکانی خۆتان دەگرن. وتم: بەڵێ. پاشای چین پرسی: پێش دەسپێکردنی شەڕ چی بەئێوە دەڵێن؟ وتم: پێشنیاری یەکێك لەم سێ کارە بەئێمە دەکەن و رێگەدەدەن بەئازادی یەکیان هەڵبژێرین: یا رازی بون بەئایینەکەی ئەوان کەئەگەر باوەڕیان پێ بێنین ئێمە وەك خۆیان هەژمار دەکەن، یا دانی باج کەئەگەر بیدەین، دەمانپارێزن، یا ئامادە بون بۆ شەڕ کەئەگەر ئەم کارە بکەین، بێ گومان هێرشمان دەکەنە سەر. پاشای چین پرسی: لەگەورەکانی خۆیان چۆن فەرمان دەبەن؟ وتم: فەرمانبردارترین و ئاگاترینی خەڵکانن. پرسی: چ شتێك بەرەوا دەزانن و چی بەناڕەوا؟ وەڵامم دایەوە. پرسی: ئایا ناڕەوا بەرەوا دەزانن یا ڕەوا بەناڕەوا؟ وتم: هەرگیز. پاشای چین وتی: بەم شێوەیە ئەم خەڵکە بەردەوام سەرکەوتو دەبن تا ناڕەواکانی خۆیان بەرەوا بزانن و ڕەواکان بەناڕەوا. پرسی: جل و بەرگیان چۆنە؟ وەڵامم دایەوە. وتی: سوار کام چوارپێ دەبن؟ وتم: ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی. من وەسفی ئەسپی عەرەبیم بۆ کرد. وتی:چ ئەسپانێکی باشن! هەروەها باسی وشتر و چۆنیەتی خەوتن و بارکردنیم، بۆ باس کرد. وتی: ئەمە تایبەتمەندی ئەسپە گەردن بڵندەکانە. ئەو بەم پەیکە نامەیەکی بۆ یەزدگێرد نوسی: ویستم سوپایەك بۆ تۆ رەوانە بکەم

کەپێشەنگەکەی لەمەرو بێت و کۆتاییەکەی لەچین. ئەوەی ڕێگەی لێگرتم، ئائاگایی لەئەرکەکەم نەبو، بەڵام ئەو خەڵکانەی نێردراوەکەت بۆ منی باس کرد، ئەگەر ئاهەنگی کێوەکان بکەن، دەیجوڵێنن و ئەگەر گەورەکانیان فەرمانیان پێبدەن من لەسەر تەختەکەم دێننە خوار و ئەمە تا ئەو کاتەیە هەڵگری ئەم تایبەتمەندیانە بن. بەئاشتی پێشوازیان لێبکە و لەوان بەمە رازی بەسازگاری لەگەڵ تۆ بگرنە بەر و دژی تۆ ڕانەپەڕن، ئەوان بۆ ئەو کارە هان مەدە. لەم کاتەدا یەزدگێرد و بنەماڵەی خوسرەوان بەپەیمان و پشتیوانی خاقان لەفەرغانە مانەوە.

کاتێك هەواڵی سەرکەوتن بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت، خەڵکی کۆکردەوە و وتاریدا و نامەی سەرکەوتنەکەی بۆ خوێندنەوە و لەوتارەکەی سوپاسی خوای کرد بۆ بەدیهێنانی مژدەکانی و دواتر وتی: ئاگادار بن پاشایەتی ئێرانیەکان بەرەو نەمان دەڕوات و فارسەکان بستێك وڵاتی خۆیانیان بەدەستەوە نیە تا لەوێوە زیان لەموسوڵمانان بدەن. خواوەند زەوی و سامان و منداڵەکانی ئەوانی بەمیرات هەڵگرەکانی ئێوە بەخشیوە تا بزانێت چۆن هەڵس کەوت دەکەن. کرداری خۆتان مەگۆڕن تا خوا کەسانیتر نەکاتە جێگوزینی ئێوە.

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی خوراسان لەرۆژگاری عوسمان بو کەئاماژەی پێدەدەین.

## گرتنی شارەزور و سامغان

کاتێك عومەر عەزرە کوڕی قەیسی کردە فەرمانڕەوایی حیلوان، هەوڵیدا دەست بەسەر شارەزوردا بگرێت بەڵام نەیتوانی. بەدوای ئەو عەتەبە کوڕی فەرقەد ئاهەنگی ئەو ناوچەی کرد و دوای شەڕێك دەستی بەسەردا گرت و پەیمانێکی ئاشتی هاوشێوەی پەیمانی حیلوان لەگەڵ ئەوان بەست. لەوێ هەندێ کات دوپشك بەموسوڵمانانیەوە دەدا و دەمردن. ئەو لەگەڵ خەڵکی سامغان و داراباد لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی بەست و دەستەیەکی فراوان لەکوردەکانی کوشت. بۆ عومەری نوسی: من تا ئازەربایەجان ڕۆشتومەتە پێش. عومەر ئەوی کردە فەرمانڕەوایی ئەم ناوچە و هەرسمە کوڕی عەرفەجەی کردە فەرمانڕەوایی موسڵ. شارەزور و دەوروبەرەکەی پەیوەستی موسڵ بو تا ئەوەی لەکۆتایی خەلافەتی هارون لێی جیاکرایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك.

لەم ساڵەدا معاویە هێرشی کردە سەر سەرزەمینی رۆم و هاورێ لەگەڵ دەهەزار سوار کار لەموسوڵمانان گەشتنە ئەو سەرزەمینە. لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە و عەبولەلیك کوڕی مەروان لەدایك بون.

هەروەها عومەر لەم ساڵەدا لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. کارگوزارەکانی لەسەر شارەکان هەمان کەسانی پێشوبون جگە لەکوفە کەموغەیرە کوڕی شەعبە فەرمانڕەوایەتی دەکرد و بەسرە کەئەبو موسائەشعەری فەرمانڕدوایەتی گرتە دەست.

## روداوەکانی ساڵی بیست و سێیەمی کۆچی(٦٤٤ زایینی)

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی ئیستەخر لەساڵی ٦٤٤/٢٣ زایینی رویدا. دەستەیەکیتر دەڵێن: گرتنەکەی دوای دوایین گرتنەوەی شاری توج رویدا.

### گرتنی توج

کاتێك خەڵکی بەسرە هاوشێوەی فەرمانڕەواکان لەسەر شارە جۆراوجۆرەکانی ئێران، شارەکەی خۆیان بەجێهێشت ( و ساریە کوڕی زونەیمی کەنانی لەناو ئەواندا بو)، درێژەیان بەرێگەکەیان دا و بیستیان کەئێرانیەکان لەتوج کۆبونەتەوە. موسوڵمانان ئاهەنگی ئەوانیان نەکرد بەڵکو هەر فەرمانڕەوایەك بەرەو ئەو ناوچانە بەرێکەوت کە بۆ فەرمانڕەوایەتی کردنی دەست نیشان کرابو. ئەم هەواڵە بەخەڵکی ئێران گەیشت. ئەوان هاوشێوەی موسوڵمانان بلاّوبونەوە و لێرەوە بو شکەست و پچڕانێکی سەراسەری کەلێنی لەناو ئەواندا دروست کرد. موجاشیع کوڕی مەسعود ئاهەنگی شاپورخەرەی کرد. ئەو لەتوج روبەروی ئێرانیەکان بویەوە و شەڕەکەیان بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بو. ئێرانیەکان شکەستیان خوارد وموسوڵمانان تائەو شوێنەی دەیانتوانی ئەوانیان کوشتار کرد و بەشێوەیەکی سەراسەری تێکیان شکاندن. هەرچی لەناو ئوردوی ئێراندا بو، تالاّنیان کرد و گەمارۆیان خستە سەرتوج و دەستیان بەسەردا گرت و ژومارەیەکی زۆر لەخەڵکیان کوشت و ئەوەی دەستیان کەوت، تالاّنیان کرد. ئەمە دوایین گرتنی توج بو. یەکەم گرتنی توج ئەوە بو کەسوپاکەی عەلا کوڕی حەزرەمی پێشڕەویان کرد و ئەمە لەرۆژگاری تاووس ئەنجامدرا. دواتر پێشنیاری دانی باجیان پێکردن وگەڕانەوە و خەڵکانی توج بەمە رازی بون. موجاشیع کوڕی مەسعود هەواڵی سەرکەوتنی لەگەڵ پێنج یەك بۆ عومەر کوڕی خەتاب رەوانە کرد.

## گرتنی ئیستەخر و گور و شارەکانیتر

عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاصی سەقەفی ناهەنگی ئیستەخری کرد. ئەو لەگور روبەروی خەڵکی ئیستەخر بویەوە. شەڕ دەستی پێکرد و ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و موسوڵمانان دەستیان بەسەر گوردا گرت و دواتر هێرشیان کردە سەر ئیستەخر و تا ئەو شوێنەی خوا ویستی، کوشتاریان کرد. دەستەیەك لەوان هەڵاتن. عوسمان پێشنیاری باج و ئەماندانی پێکردن. هیربۆد بەمە رازی بو و هەڵاتوان گەڕانەوە. عوسمان لەکاتی تێکشکانی ئەوان تاڵانیەکانی کۆکردبویەوە. ئەو پێنج یەکی بۆ عومەر نارد و پاشماوەکەی لەناو خەڵکدا دابەش کرد.

عوسمان کازەرون و نوبەندجانی گرت و دەستی بەسەر زەویەکانیدا گرت. ئەولەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری دەستیان بەسەر شیراز وئەرجاندا گرت و سینیزیان لەسەر بنەمای دانی باج کەوتە دەست. هەروەها عوسمان ئاهەنگی جەنابای کرد و دەستی بەسەردا گرت. سوپای ئێران لەپانتاییەکانی جەهرۆم روبەروی بونەوە کەعوسمان ئەوانی تێکشکاند و دەستی بەسەر ئەو ناوچانەیشدا گرت.

دواتر لەکۆتایی خەلافەتی عومەر و دەسپێکی خەلافەتی عوسمان، شەهرەك راپەڕی و عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص بۆ جاری دوەم بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێکەوت. هێزە پشتیوانەکان بەسەرکردایەتی عوبەیدالله کوڕی مەعمیر و شبل کوڕی مەعبەد لەبەسرەوە پەیوەستی بون. هەردولای شەڕکەر لەسەرزەمینی پارس روبەروی یەك بونەوە. شەهرەك لەگەرماوگەرمی شەڕەکە لەکوڕەکەی پرسی: کوڕەکەم نانی نیوەڕۆ لەکوێ بخۆین، لێرە یا لەشاری رەی؟ کوڕ وتی: ئەگەر دەست بەردارمان بن، نانی نیوەڕۆ نە لێرە دەخۆین نەلە شاری رەی، بەڵکو لەماڵەوە. بەڵام سوێند بەخوا گومان ناکەم ئەوان دەستبەردارمان بن. هێشتا وتەکانی تەواو نەکردبو کەموسوڵمانان ئاگری شەڕیان خۆش کرد و بەهەمو هێزیانەوە هێرشیان کردە سەریان و ئێرانیەکان لەناو بڵێسەکانی ئەم ئاگرەدا سوتان. شەهرەك و کوڕەکەی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەخەڵك کوژران. ئەوکەسەی شەهرەکی کوشت، حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص برای عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص بو. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو ئەو لەسەر دەستی سوار کوڕی

هومامی عەبدی کوژرا کەڕمەکەی لەجەرگی چەقاند و گیان لەجەستی دەرچو. کوڕەی شەهرەك هێرشی کردە سەر سوار و کوشتی.

دەستەیەك دەڵێن: شەڕی ئیستەخر لەساڵی ٦٤٩/٢٨ زایینی و دوایین گرتنی پارس لەساڵی ٦٥٠/٢٩ زایینی رویدا.

دەستەیەك دەڵێن: عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص براکەی حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاصی لەگەڵ دو هەزار پیاوی شەڕکەر لەبەحرەینەوە رەوانەی ئێران کرد و ئەو لەسەر رێگەی خۆی دەستی بەسەر جەزیرەی بەرکاواندا گرت و دواتر بەرەو توج بەرێکەوت. خوسرەو پێشتر شەهرەکی رەوانە کردبو وئەوان روبەروی شەهرەك بونەوە. جارود و ئەبو صوفرە فەرماندەی دو باڵی چەپ و راستی سوپای موسوڵمانان بون. ئەبو صوفرە باوکی موهەلەبە. ئێرانیەکان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان و شکەستیان دان. جارود وتی: فەرماندە، سوپاکەمان لەناوچو. فەرماندە وتی: بەزویی چۆنیەتی ئەم کارە دەبینی. دەڵێت: ئەوەندەی نەخایاند ئەسپە بێ سوارەکانی ئێرانیەکان دەرکەوتن و موسوڵمانان شوێنیان کەوتبون و بەردەوام کوشتاریان دەکردن. سەرەکان لەسەر زەوی بڵاوبونەوە. موعکبێر سەرێکی گەورە و ئەستوری بینی و وتی: فەرماندە، ئەمە سەری ئاژی دەهاك یانی شەهرەکە. ئێرانیەکان لەشاری شاپور گەمارۆدران. پاشاکەیان ئەرزەنبان لەسەر تەسلیم کردنی ئەم شارە ئاشتی کرد. حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص لەو بۆ شەڕی خەڵکانی ئیستەخر کەڵکی وەرگرت. لەم کاتەدا عومەر کوڕی خەتاب مرد و عوسمان کوڕی عەفان، خەلیفەی تازە، عوبەیدالله کوڕی موعمێری لەجیاتی ئەو رەوانە کرد. هەواڵ بەعوبەیدالله گەیشت کەئەرزەنبان دەیەوێت خیانەتی لێ بکات. پێی وت: حەزدەکەم بۆ هاورێکانی من خواردنێك دروست بکەیت و گایەك سەر ببڕیت و ئێسقانەکانی لەناو کاسەیەك لەبەردەم مندا دانێیت چونکە من حەز دەکەم گۆشت بەدیان لەئێسقان جیا بکەمەوە. ئەرزەنبان ئەو کارەی کرد. عوبەیدالله ئەو ئێسقانانەی کەتەنیا بەتەور دەشکان، هەڵگرت و بەدەست لەت و پەتی کردن و مۆخەکەی دەردەهێنا و دەیخوارد. ئەو یەکێك لەبەهێزترین پیاوەکان بو. کاتێك ئەرزەنبان ئەمەی بینی، کەوتە سەر قاچی و وتی: ئەی فەرمانده، پەنا بۆ تۆ دەبەم! عوبەیدالله ئەمانی دا. ئەو کۆشکەنجیری بەدەست هێنا. پێشنیاری بەسوپاکەی خۆی کرد و وتی: ئێوە بەخواستی

خوا بەزوویی دەست بەسەر ئەم شارەدا دەگرن. ماوەیەك لەگەڵ من ئەوان کوشتار کەن. ئەو کارەیان کرد و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکیان کوشت و عوبەیدالله کوڕی موعمێر مرد. دەستەیەك دەڵێن: کوژرانی ئەو لەساڵی ٦٥٩/٢٩ زایینی رویدا.

## گرتنی دارابگەرد و فەسا

ساریە کوڕی زونەیمی دۆئەلی ئاهەنگی دارابگەرد و فەسای کرد تا گەشتە سوپاکەی ئەوان و لای ئەوان دابەزی و تا ئەو کاتەی خوا ویستی، گەمارۆی خستە سەر ئەوان. دواتر ئێرانیەکان داوای هاوکاریان لەهاوڕێکانی خۆیان کرد و ئەوان کۆبونەوە و کوردەکانی ئێران هاوکاریان کردن. موسوڵمانان روبەروی کارێکی دژوار و سوپایەکی گەورە بونەوە و ئێرانیەکان لەهەر لایەکەوە ئاهەنگی ئەوانیان دەکرد. عومەر لەو شەوەدا، وەك چۆن خەوێك ببینێت، شەڕ و ژومارەی ئەوانی تا بەشێك لەرۆژ بینی. کاتێك بەیانی داهات، هاواری کرد، بۆ نوێژ کۆببنەوە! کاتێك ئەو کاتژمێرە گەیشت کەلەخەودا بینیبوی، ڕۆشتە لای ئەوان. کوڕی زونەیم و سوپای موسوڵمانان لەدەشتێکدا بون کەئەگەر لەوێ دەمانەوە، گەمارۆ دەدران و ئەگەر کێوەکەی پشت سەریان دەکردە پاڵپشت، تەنیا لەیەك بەرەوە روبەروی ئێرانیەکان دەبونەوە. عومەر هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، من ئەم دوسوپایەم بینی (خەوەکەی خۆی گێڕایەوە). عومەر لەناو وتارەکەی خۆی هاواری کرد: ئەی ساریە کوڕی زونەیم، پشت بەکێوەکە ببەستە، کێوەکە! دواتر روی کردە ئەوان وتی: خواوەند سوپایەکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەگەری هەیە دەستەیەك لەوان ئەم پەیامەی من بگەیێنن. ساریە کوڕی زونەیم وهاوڕێکانی ئەم هاوارەیان بیست و پەنایان بۆ کێوەکە برد و دواتر لەگەڵ ئەوان شەڕیان دەست پێکرد. خواوەند ئەوانی شکەستدا و موسوڵمانان تالآنی زۆریان دەست کەوت. لەناو سامانەکاندا سەوەتەیەکی پڕگەوهەریان بینی کەساریە وەریگرت و لەگەڵ هەواڵی سەرکەوتن بۆ عومەر کوڕی خەتابی نارد. نێردراوەکە کاتێك گەیشتە لای عومەر کەخواردنی بەخەڵك دەدا. پێی فەرمو کەدانیشت و خواردی. کاتێك عومەر گەڕایەوە، نێردراو بەدوایدا ڕۆشت. عومەر گومانی برد کەئەو تێر نەبوە. فەرمانی پێدا و ڕۆشتە ناو ماڵەکەی، کاتێك دانیشت، عومەر فەرموی کەخواردنیان بۆ هێنا کەنان و رۆن و خوێ بو.

هەردوکیان خواردیان. کاتێك تەواو بون، پیاو وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، من نێردراوی ساریەم. عومەر وتی: دەست خۆش، بەخێر بێیت. دواتر ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە بەشێوەیەك ئەژنۆیان لەیەکتر دەدرا. عومەر سەبارەت بەموسوڵمانان پرسیاری لێکرد. پیاو لەسەوەتەکە ئاگاداری کردەوە. عومەر سەیری کرد و هاواری کرد: شیاوم نیت و هیچ سودێکت لەمن پێ ناگات. دەبێت ئەمە ببەیت بۆ سوپاییەکان و لەناو ئەواندا دابەشی بکەیت. عومەر ئەوی لەخۆی دورخستەوە. پیاو وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران. من وشترەکەی خۆم هیلاك کردوە و بۆ وەرگرتنی بەشەکەی خۆم قەرزم کردوە. شتێك بەمن بدە تا بتوانم بگەڕێمەوە بۆ سەر کارەکەم. ئەوەندەی پێداگری کرد کە لەوشترە زەکاتیەکان، وشترێکی پێدا و وشترەکەی ئەوی بردە جێگای زەکات. نێردراو گەڕایەوە بەشێوەیەك کەتوڕەیی عومەر لەپشت سەریەوە بو و هیچ شتێك لەبەرچاوی نەدەبینرا. خەڵکانی مەدینە پرسیاریان لەنێردراوەکە کردە: ئایا لەرۆژی شەڕ هیچ دەنگێکتان بیست؟ وتی: بەڵێ بیستمان کە: ئەی ساریە کوڕی زونەیم، پشت بەکێوەکە ببەستە، کێوەکە. ئەوەندەی نەمابو لەناو بچین، پەنامان بۆ کێوەکە برد و خوا سەرکەوتنی پێ بەخشین.

## گرتنی کرمان

دواتر سوهەیل کوڕی عودەی ئاهەنگی کرمانی کرد و عەبداڵله کوڕی عەبداڵله کوڕی عەتەبانیش پەیوەستی بو. خەڵکی کرمان لەبەرابەر ئەوان کۆبونەوە وبۆ شەڕێکی سەراسەری ریزیان بەست و لەجۆرێك زرێپۆشی تایبەت بەو رۆژگارە کەڵکیان وەردەگرت. شەڕ لەخوارەوەی سەرزەمینەکانی ئەوان رویدا و خوا ئێرانیەکانی شکەستدا و موسوڵمانان رێگەیان لێ گرتن. نوسەری کوڕی عەمرۆ عەجەلی سنورداری ئەوێی کوشت و سوهەیل لەرێگەی دێهاتەکانی ئەمرۆیی بەرەو جیرۆفت بەرێکەوت و عەبداڵله کوڕی عەبداڵله لەبیابانی سیرەوە رەوانە بو. هەرچەندەیان ویست، مەڕ ووشتریان هەڵگرت. وشتر و مەڕەکانیان هەڵسەنگاند و لەسەر بنەمای بەهاکەیان بەشی سوپاییەکانیاندا چونکە مەڕەکان بەهایان لەئەسپە ڕەسنەکان زیاتر بو و ئەوان نەیانویست بەهاکان زیاد بکەن. هەواڵی ئەم کارەیان بۆ عومەر نوسی و ئەو وەڵامی

...ەوە: ئەگەر دەزانن مەڕەکان بەهایان زیاترە، نرخەکان زیاتر بکەن.

...ستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی دەستی بەسەر شاری کرماندا گرت، عەبداللە کوڕی ...ودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی بو کە لەرۆژگاری عومەر بەم کارە هەستا و دواتر ...ەکرمانەوە ڕۆشتە تبسین و دواتر گەڕایەوە لای عومەر و وتی: تبسین بەمن بسپێرە. عومەر ویستی ئەم کارە بکات بەلاّم پێیان وت کەتبسین دو دێهاتە و لەبەر ئەمە خۆی لەم کارە خۆی بەدور گرت.

## گرتنی سیستان

دواتر عاصم کوڕی عەمرۆ ئاهەنگی سیستانی کرد و عەبداللە کوڕی عومەیر پەیوەستی بو. خەڵك پێشوازیان لێکردن. ئەوان لەخوارەوەی سەرزەمینی سیستان چاویان بەخەڵك کەوت. موسوڵمانان ئەوانیان شکەستدا ودواتر شوێنیان کەوتن و لەزەرنج گەمارۆیاندان و کەلێنیان کردە ناو سەرزەمینی (سیستان ماە). دواتر ئەوان لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی زەرنج و سەرزەمینە دەست بەسەرداگیراوەکان خوازیاری ئاشتی بون و موسوڵمانان بەمە ڕازی بون. سیستانیەکان لەپەیمان نامەی ئاشتی خۆیان ئەمەیان جێگیر کردبو کەدەشتە نارێکەکان وەك پاسگا هەژمار بکرێن. لەبەر ئەمە موسوڵمانان لەڕۆشتن بۆ ئەو شوێنانە خۆیان بەدور دەگرت تا نەوەك شتێك لەوێ بەدەست بێنن و بەپەیمان شکێن ناو ببرێن. خەڵکی سیستان لەسەر بنەمای دانی باج ئارامیان پێبڕا. سیستان گەورەتر لەخوراسان و سنورێکی بەربلاّوتر و دورتر لەوێ بو. سیستانیەکان لەگەڵ خەڵکانی قەندهار و تورکان و خەڵکانێکی زیاتر شەڕیان دەکرد. بەم شێوە بو تا لەرۆژگاری معاویە (شاە) لەبراکەی رەتبیل (زەنبیل) بۆ شارێك بەناوی ئامول رایکرد و لەبەرابەر سەلەم کوڕی زیاد کەلەو کاتەدا فەرمانڕەوایی سیستان بو، فەرمانبرداری خۆی نیشاندا. سەلەم لەم کارە شادمان بو و پەیمانێکی بۆ نوسین و ئەوانی لەو سەرزەمینانەدا نیشتەجێ کرد و بۆ معاویەی نوسی و وای نیشاندا کەلەبەرژەوەندی ئەو سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. معاویە وتی: کوڕی براکەم بۆ کارێك خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕێت کەمن خەمبار دەکات. وتی: بۆ ئەی سەروەری باوەڕداران؟ معاویە وتی: ئامول شارێکە کەلەنێوان ئەوێ تا زەرنج گرفتاری و دژواریە و ئەمانە خەڵکانێکی

پەیمان شکێنن. کاتێك بەیانی کێو لەبەر پەیمان شکێنی بجولێت، ئاسانترین کارێك کەدەیکەن ئەوەیە دەست بەسەر سەراسەری ئامولدا دەگرن. ئەو، ئەوانی لەسەر پەیمانی سەلەم کوڕی زیاد پاراست. کاتێك دوای لەناوچونی معاویە، ئاژاوەکەوتە ئەو ناوچانە، شا لەدین هەڵگەڕایەوە و دەستی بەسەر ئامولدا گرت و رەتبیل لەو بۆ جێگەکەی خۆی پەنای برد. تەنانەت کاتێك خەڵك بەکاروباری دیکەوە سەرقاڵ بون، بەوەیش رازی نەبو و چاوی تەماحی برپە زەرەنج و هێرشی کردە سەر و گەمارۆی خستە سەر تا ئەوەی هێزی یارمەتیدەر لەبەسرەوە هاوکاریان کردن و رەتبیل و هاورێکانی بەهێز بون و ئەو شارانە تا رۆژی مردنی معاویە پشێوی و ئاژاوەیان بەخۆیانەوە نەبینی.

## گرتنی مەکران

حەکەم کوڕی عەمرۆ تەغلەبی ئاهەنگی مەروانی کرد تا گەشتە ئەو ناوچەیە و شەهاب کوڕی مەخارق و سوهەیل کوڕی عودەی و عەبدالله کوڕی عەتەبان پەیوەستی بون. ئەوان لەشوێنێك دابەزین کەکەمێك لەخوار روبارەکەوە بو و مەکرانیەکان لەسەر لێواری روبارەکە جێگیر ببون. پاشاکەیان داوای هاوکاری لەپاشای سند کرد کەسوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری کردنی رەوانە کرد. ئەوان روبەروی موسوڵمانەکان بونەوە. شکەستیان خوارد وبەسەختی هەرچی زیاتر کوشتار کران و گۆڕەپانی شەڕ بەلاشەی کوژراوان داپۆشرا. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و بۆ چەندین رۆژی بەردەوام ئەوانیان کوشتار کرد تا گەشتنە روبارەکە. سوپایی ئیسلام بۆ مەکران گەڕانەوە و لەوێ نیشتەجێ بون. حەکەم کوڕی عەمرۆ هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عومەر نوسی وپێنج یەکی بەصەحاری عەبدی دا رەوانە کرد. کاتێك گەیشتە مەدینە، عومەر سەبارەت بەمەکران پرسیاری لێکرد. صەحار وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مەکران سەرزەمینێکە بەدەشتێك هاوشێوەی کوێستان، ئاوەکەی کەمتر لەدڵۆپەی باران، خورماکەی هاوشێوەی خەوش و خۆڵ، دوژمنەکەی پاڵەوان، باشیەکەی هۆکارێکە بۆ زیان، زیانەکەی بەردەوام داوێنی خەڵکان دەگرێت، فراوانیەکەی بەرەو نەمان دەڕوات، کەمەکەی بێ بەهاترە لەوەی باسی بکرێت و ئەوپەڕەکەی خراپترە لەوەی باسم کرد.

عومەر وتی: تۆ وتاردەری یا نێردراو؟ سوێند بەخوا هیچ سوپایەك بە فەرمانی من بۆ شەڕ لەو ناوچەیە ناڕوات. دواتر بۆ سوهەیل کوڕی عودەی و حەکەم کوڕی عەمرۆ نامەی نوسی: هیچ کام لەشەڕکەرەکانی ئێوە لەمەکران ئەولاتر نەڕوات. فەرمانیدا، ئەو فیلانەی موسوڵمانان وەك تالآنی دەستیان کەوتوە، لەناو سەرزەمینە ئیسلامیەکان بفرۆشرێن و بەهاکەی لەناو شەڕکەراندا دابەش بکرێت.

## هەواڵی پیرود لەئەهواز

کاتێك سوارەکان بەرەو شارەکان ڕۆشتن، لەپیرود (کۆتایی روبار) دەستەیەکی زۆر لەکوردەکان و کەسانیتر کۆبونەوە. عومەر فەرمانی بەئەبو موسای ئەشعەری دابو تا کۆتایی ئەو سەرزمینانەی لەلایەن خەڵکانی بەسرەوە ئەمانیان پێدرابو، پێشڕەوی بکات تا کەس نەتوانێت هێرش بکاتە سەر موسوڵمانەکان. ئەو ترسا دەستەیەك لەسوپاکەی لەناو بچن یا لەپشتەوە هێرشیان بکرێتە سەر. دواتر بەرێکەوت و لەپیرود دابەزین. ئەوان لەمانگی رەمەزان/ژوئیەی ٦٤٤ زایینی لەنێوان روباری تیری و مونازێر روبەروی یەك بونەوە. موهاجیر کوڕی زیاد بەجل و بەرگی رازاوە و ئامادە بۆ گیاندان هاتەدەر و ئەبوموسا موسوڵمانانی سوێنددا تا ڕۆژوەکانی خۆیان بشکێنن. موهاجیر هێرشی کرد و ئازایانە شەڕی کرد تا کوژرا. خوا ئێرانیەکانی لاواز کرد تائەو شوێنەی لەناو قەڵآکاندا خۆیان حەشاردا. رەبیع کوڕی زیاد بۆ مەرگی براکەی بەردەوام دەگریا و نەمانی براکەی بەدژوار و گران لەقەڵەم دەدا. ئەبو موسا بەزەیی بەودا هاتەوە و کردی بەفەرماندەی سوپاکەی براکەی. ئەبو موسا بەرێکەوت تا گەیشتە ئیسفەهان و ئەو موسوڵمانانەی (جی) یان گەمارۆدابو، لەوێ کۆبونەوە. کاتێك ئەم شارە دەستی بەسەرداگیرا، ئەبو موسا بۆ بەسرە گەڕایەوە. رەبیع کوڕی زیادی حارسی لەروباری تیریەوە دەستی بەسەر پیرودا گرت و هەمو سامانی خەڵکەکەی وەك تالآنی هەڵگرت.

ئەبو موسا بەدوای وەفدێکدا دەگەڕا تاوەك نوێنەری خۆی بۆ لای عومەری رەوانە بکات. زەببە کوڕی میحصەنی عەنزی خوازیاری ئەوەبو تا لەناو دەستەی نوێنەرایەتیەکەدا بێت بەڵآم ئەبو موسا رازی نەبو. ئەبو موسا لەئەسیرەکانی پیرود شەست کوڕی هەڵبژاردبو. زەببە ڕۆشتە لای عومەر و گلەیی دەست پێکرد. ئەبوموسا چۆنیەتی ئەم

کارەی بۆ عومەر نوسی. کاتێك زەببە گەیشتە لای عومەر، سڵاوی لێکرد. عومەر پرسی: کێیت؟ وتی: زەببەم. عومەر وتی: ناخۆش هاتیت و لەبنەماڵەی ئێمە نیت. زەببە وتی: بەڵام خۆش هی خوایە و بنەماڵە کەخوا لێی بێ نیازە. عومەر سەبارەت بەکارەکەی پرسیاری لێکرد. زەببە وتی: ئەبوموسا شەست کوڕی لەکوڕی دێدارەکان بۆ خۆی هەڵبژاردوە. ئەو کەنیزێکی مانگ روخساری بەناوی عەقیلە هەیە کەنیمەڕۆ قازانێك دەخوات و ئێوارێ قازانێکیتر. ئەو دوپەیمانەی هەیە و دو ئەنگوستیلە. ئەو کاروبارەکانی بەسرەی بەزیاد کوڕی ئەبی سوفیان سپاردوە و هەزار درەمی وەك دیاری بەحەتیئە بەخشیوە.

عومەر ئەبو موسای ئەشعەری بانگ کرد. کاتێك گەیشتە لای ئەو، بۆ چەندین رۆژ ئەوی لەخۆی دور خستەوە و دواتر ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کرد. عومەر بەئامادەبونی زەببە لێکۆڵینەوەی لەئەبوموسا دەسپێکرد. زەببە وتی: ئەو شەست کوڕی بۆ خۆی هەڵبژاردوە. ئەبوموسا وتی: ئەوانیان بەمن نیشاندا وبەهای ئازادی ئەوان زۆربو. ئەوانم بەبنەماڵەکانیان فرۆشت و بەهاکەیانم لەناو موسوڵمانانندا دابەش کرد. زەببە وتی: ئەو درۆی نەکرد و منیش درۆم نەکرد. زەببە وتی: ئەو دوپەیمانە (ئەندازەی ١٤٤ مەتری چوارگۆشە زەمین)ی هەیە. ئەبوموسا وتی: راست دەکات. یەکیان بۆ بنەماڵەکەمە کەلەوە بژێویان پێ دەدەم و یەکیان بۆ موسوڵمانانە کەلەدەستی ئەواندایە و بژێوی خۆیانی لێ هەڵدەگرن. زەببە وتی: نەئەو درۆ دەکات نە من. کاتێك باسی عەقیلەی کرد، ئەبوموسا بێدەنگ بو و هیچی نەوت. زانی زەببە راستیەکانی بەو وتوە. زەببە وتی: کاروبارەکانی بەسرەی بەزیاد کوڕی ئوبیە سپاردوە. ئەبوموسا وتی: بینیم کە شیاو و بیرمەند و بەئەزمونە. لەبەر ئەمە کاروبارەکانم پێ سپارد. زەببە وتی: بەحەتیئە (وتاردەری بەناوبانگی عەرەب) هەزار درەمی بەخشیوە. ئەبوموسا وتی: بەم کارە دەمیم بەست تا جوێن بەمن نەدات. عومەر ئەوەی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە و فەرمانیدا زیاد و عەقیلە بۆ لای ئەو بنێرێت. ئەبو موسا ئەو کارەی کرد. کاتێك زیاد گەیشتە لای عومەر، سەبارەت بەکار و داهاتی مانگانە و کارە پێویستەکانی دین و کارە شیاوەکانی پێغەمبەر(ص) پرسیاری لێکرد. بینی کەپیاوێکی بەتوانا و بیرمەندە. ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە و فەرمانی بەفەرماندەکانی بەسرەدا راوێژی لەگەڵ بکەن و

وتەکانی بەکار ببەن. ئەو عەقیلەی لەمەدینە زیندانی کرد.

دواتر عومەر وتی: ئاگادار بن کەزەببە ڕقی لەئەبوموسا هەڵگرت و لەبەر ڕق و کینە لەو جیابویەوە چونکە دەترسا مەبەست و ئارەزوەکانی ئەم دنیا لەدەست بدات و لەسەر ئەم بنەمایە راست و درۆی سەبارەت بەو هێنایە سەرزمان. درۆکەی وتەراستەکانی لەناوبرد و بەفیڕۆیدا. درۆمەکەن چونکە درۆ بێژەرەکەی بەرەو جەهەننەم دەبات.

## گێڕانەوەی کاری سەلمە کوڕی قەیسی ئەشجەعی و کوردەکان

شێوازی کاری عومەر بەمشێوە بو کاتێك سوپایەك لەموسوڵمانان لای ئەو کۆدەبونەوە، پیاوێکی زانا و شارەزایی لەکاروباری دینی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان دەکرد. ئەم جارە دەستەیەك لەموسوڵمانان لای ئەو کۆبونەوە. ئەو سەلە کوڕی قەیسی ئەشجەعی کردە فەرماندەی ئەوان و وتی: بەرێکەوە، بەناوی خوا و لەرێگەی خوادا شەڕ بکە. کاتێك روبەروی دوژمنانتان بونەوە، پێشنیاری ئیسلامیان پێبکەن، ئەگەر رازی بون با لەناو سەرزەمینەکانی خۆیان بمێننەوە، دەبێت زەکات بدەن و لەتالآنیەکانی شەڕ بەشیان نەبێت. ئەگەر لەشەڕەکاندا هاورێیەتی ئێوە بکەن، ئەوەی بۆ ئێوە ڕەوا و شیاوە، بۆ ئەوانیش بەهەمان شێوە ڕەوایە و شیاو. ئەگەر رازی نەبون، پێشنیاری دانی باجیان پێ بکەن. ئەگەر رازی بن، لەوانی وەربگرن، ئەگەر رازی نەبون، شەڕیان لەگەڵ بکەن. ئەگەر لەبەرابەر ئێوەدا لەقەلآکاندا خۆیان حەشاردا و داوا لەئێوە بکەن بەپێی فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ص)ەکەی بێنە لای ئێوە و لای ئێوە ئەمان بدرێن، رازی نەبن چونکە نازانن دەستان بەفەرمانی خوا وپێغەمبەر(ص)ەکەی دەگات تا ئەمانەکەی ئەوان پشت راست بکەنەوە یا دەستتان ناگات و پشت راستی ناکەنەوە. پەیمان شکێنی مەکەن، منداڵەکان مەکوژن و گوێ و لوتی کەس مەبڕن و رێز لەجەستەی کوژراوەکان بگرن.

دەڵێت: ئەوان بەرێکەوتن تا روبەروی دەستەیەك لەکوردەکان بونەوە و پێشنیاری ئیسلام یا باجیان پێکردن. کوردەکان بەمە رازی نەبون. شەڕیان لەگەڵ کردن و کوردەکانیان شکەستدا و پیاوە شەڕکەرەکانی ئەوانیان کوشت و ژنان و منداڵانیان بەئەسیری گرت و لەناو خۆیاندا دابەشیان کردن. سەلە برێك گەوهەری لەناو سەوەتەیەك بینی و داوای مۆڵەتی لەموسوڵمانان کرد و رەوانەی لای عومەری کرد.

نێردراو لەگەڵ هەواڵی سەرکەوتن و سەوەتەی پڕگەوهەر گەیشتە لای عومەر. عومەر سەبارەت بەخەڵك پرسیاری دەکرد و نێردراو بەردەوام وەڵامی دایەوە تا گەشتە گەوهەرەکان. عومەر بەتەواوی تورە بو. وتی: ئەگەر خەڵك پێش گەیشتنی تۆ بلاوەی لێ بکەن، بەسەختی ئازارت دەدەم. نێردراو بەرێکەوت تا گەیشتە لای سەلە. سەلە گەوهەرەکانی فرۆشت و بەهاکەی لەناو خەڵکدا دابەش کرد. هەر نقێمێك بەپێنج درەم فرۆشرا و بەهاکەی بیست هەزار درەم بو.

لەم ساڵەدا عومەر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد و هاوسەرەکانی پێغەمبەر(ص) هاورێیەتیان دەکرد و ئەمە دواییتی حەجی عومەر کوڕی خەتاب بو. هەروەها عومەر لەم ساڵەدا کوژرا.

## کوژرانی عومەر کوڕی خەتاب

مسوەر کوڕی مەخریمە دەڵێت: رۆژێك عومەر ڕۆشتەدەر و لەبازار دەستی بەگەڕان کرد. ئەبولۆلۆ کۆیلەی موغەیرە کوڕی شەعبە کەپیاوێکی مەسیحی بو، پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، هاوکاریم بکە چونکە موغەیرە باجێکی زۆری لەسەرم داناوە. عومەر وتی: باجەکەی تۆ چەندە. ئەبولۆلۆ وتی: رۆژی دودرەم. عومەر پرسی: چ کارێك دەزانیت؟ وتی: دارتاش و نگارکێش و ئاسنگەرم. عومەر وتی: بەم پیشانەی تۆ دەیزانیت پێم وانەبێت باجەکەت زۆر بێت. عومەر وتی: هەواڵم پێگەیشتوە کەدەڵێیت: ئەگەر بمەوێت ئاشێك دروست دەکەم کەگەنم دەکاتە ئارد، بەبا. وتی: بەڵێ: عومەر وتی: بۆ من ئاشێك دروست بکە بەبا کار بکات. وتی: ئێستا کەداوات لەمن کرد ئاشێکت بۆ دروست دەکەم کەخەڵك لەرۆژهەلات و رۆژئاوا باسی بکەن! ئەبولۆلۆ ئەمەی وت و بەدوای کاری خۆیدا ڕۆشت. عومەر وتی: ئەم کۆیلەیە مژدەی مەرگی پێدام.

عومەر گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. کاتێك بەیانی داهات، کەعب الاحبار هاتەلای و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، وەسیەتی خۆت بکە چونکە بەم زوانە دەمریت و زیاتر لەسێ شەوی دیکە زیندو نیت. عومەر وتی: لەکوێوە دەزانی؟ کەعب وتی: لەناو کتێبی تەوراندا دەیبینم. عومەر وتی: هاوار، توخوا ئایا عومەر کوڕی خەتاب لەتەوراتدا دەبینی؟ کەعب وتی: بەخوا، نە، بەلام جل و بەرگی جەستە و تایبەتمەندیەکانی تۆ

دەبینم و وای لێکدەدەمەوە کەژیانی تۆ گەشتۆتە کۆتایی. دەڵێت: عومەر هیچ نەخۆشی و ئازارێکی نەبوا کاتێك بەیانی داهات، کەعب هاتە لای و وتی: دو و یەك رۆژ ماوەتەوە. کاتێك بەیانی داهات، عومەر بۆ نوێژ رۆشتەدەر. ئەو لەریزی نوێژکەران چەندین پیاوی دادەنا و کاتێك هەڵدەستانەوە تەکبیریان دەوت. ئەبولۆلۆ لەناو خەڵکدا دەرکەوت. کێردێکی دوسەری لەدەستا بو کەدەسکەکەی لەناوەڕاستەکەیدا بو. ئەو شەش کێردی لەعومەردا کەیەکیان ژێر ناوکی گرت و هەر ئەوە بو عومەری کوشت. هاورێ لەگەڵ عومەر کولەیب کوڕی بوکەیری لەیسی کە لەپشت سەریەوە بو، لەگەڵ چەند کەسێکیتری کوشت و هەڵات.

کاتێك عومەر هەستی بەگەرمی کێردەکان کرد، کەوت و فەرمانی بەعەبدولرەحمان کوڕی عەوفدا لەگەڵ خەڵك نوێژ بخوێنێت. عومەر کەوتبو. ئەویان هەڵگرت و بردیانەوە بۆ ماڵ. عەبدولرەحمانی بانگ کرد وپێی فەرمو: وەسیەتەکەم بەتۆ دەڵێم. عەبدولرەحمان وتی: ئەی خوایە خەلافەت بەمن دەبەخشیت؟ وتی: نە. عەبدولرەحمان وتی: سوێند بەخوا هەرگیز بەمە رازی نابم. عومەر وتی: کەواتە بێدەنگ بە تا پێشنیاری ئەو کەسانە بکەم کەپێغەمبەر(ص) لەکاتی مردن لێیان رازی بو. دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عوسمان کوڕی عەفان و زوبەیر کوڕی عەوام و سەعد کوڕی ئەبی وەقاصی بانگ کرد و فەرمانی پێدان: سێ رۆژ چاوەڕوانی براکەتان تەڵحە کوڕی عوبەیدالله بکەن، ئەگەر هات لەم کارەدا بەشدارە و ئەگەر نەهات کارەکەتان ئەنجام بدەن. ئەی عەلی: سوێندت دەدەم ئەگەر هاتیتە سەر کار بەنی هاشم نەکەیتە سەروەری خەڵك (بەهەمان شێوە کەمن ئەمەوەیەکانم کرد)، ئەی عوسمان سوێندت دەدەم ئەگەر هاتیتە سەر کار بەنی ئەبی موعیت نەکەیتە گەورە و فەرمانڕەوایی خەڵك. ئەی سەعد سوێندت دەدەم ئەگەر کارێك لەئەستۆ گرت، نزیکەکانت مەکەرە گەردن درێژی سەر خەڵك. هەستن و راوێژ بکەن و کۆتایی بەم کارە بێنن. دەبێت صوهەیب نوێژ لەگەڵ خەڵك بخوێنێت.

دواتر ئەبو تەڵحەی ئەنساری بانگ کرد و وتی: لەسەر دەرگای ئەو ماڵەی لێی کۆدەبنەوە، بێستە و رێگە مەدە کەس لەوان نزیك ببێتەوە. پێشنیاری خەلیفەی دوای خۆم بەئەنسار دەکەم کە لەسەر بنەمایی باوەڕی خۆیان هەڵس و کەوتیان کرد و

ماڵەکانی خۆیان بەخۆشحاڵیەوە خستە بەردەستی پێغەمبەر(ص) و کۆچکەرانی ڕێگەی خوا. دەبێت خەلیفە ڕێزی ئەنسار بگرێت، لەگەڵ چاکەکارانی ئەنسار، چاکە بکات و لەخراپەکانیان خۆش ببێت. پێشنیاری خەلیفە بەعەرەبەکان دەکەم کەبناغەی ئیسلامن. ئەو دەبێت لەسامانی ئەوان بەئەندازەیەکی ڕاست و دروست زەکات وەربگرێت و بەسەر هەژاراندا دابەشی بکات. پێشنیاری ئەمان دراوەکان لەلایەن پێغەمبەر(ص)ەوە بە خەلیفەی دوای خۆم دەکەم کەرێز لەپەیمانی ئەوان بگرێت. ئەی خوایە، ئایا پەیامەکەی خۆم گەیاندوە؟ خەلیفەی دوای خۆم هێناوەتە سەر کارێك کەلەبەری دەست پاکترە. ئەی عەبداللە، بڕۆ بزانە کێ منی کوشتوە.

عەبداللە کوڕی عومەر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەبولۆلۆ کۆیلەی موغەیرە کوڕی شەعبە تۆی کوشت. عومەر وتی: سوپاس بۆخوا کەمنی بەدەستی پیاوێك کوشت کەتەنانەت یەك جاریش سەری کوڕنوشی بۆ خوا دانەنواندوە و نوێژی نەکردوە! ئەی عەبداللە بڕۆ لای عایشە و مۆڵەتی لێ وەربگرە تا من لای گۆڕی پێغەمبەر(ص) و ئەبوبەکر بەخاك بسپێرن. ئەی عەبداللە، ئەگەر لەناو خۆیاندا ناسازگار بون، لەگەڵ زۆرینەی ئەوان بە و ئەگەر ڕاوێژیان کرد ( و دەنگیان دا و دەنگەکانیان بەرابەر بو) لەگەڵ ئەو دەستە بە کەعەبدولرەحمان کوڕی عەوفیان لەگەڵدایە. ئەی عەبداللە فەرمان بەخەڵك بدە تا بۆ پەرەستاری کردن و ماڵئاوایی کردن لەمن بێنە ژوور. لەم کاتەدا دەستەیەك لەموهاجیران و ئەنسار هاتنە ژور و سڵاویان لێکرد. عومەر پێی وتن: ئایا ئەم کارە لەبەرابەر چاوی ئێوە ئەنجام درا؟ وتیان: پەنا بەرخوا! دەڵێت: کەعب الاحبار لەگەڵ خەڵك هات و کاتێك عومەر ئەوی بینی، فەرموی:

| | |
|---|---|
| توعدنی کعب ثلاثا اعدها | ولاشك ان القول ماقال لی کعب |
| وما بی حذار الموت، انی لمیت | ولکن حذار الذنب یتبعه الذنب |

یانی: کەعب سێ ڕۆژی بەردەوام ئاگاداری کردمەوە و بەردەوام دەمژمارد، بێ گومان وتەی ڕاست ئەوەیە کەکەعب وتی. من لەمرگ ناترسم چونکە بەناچار دەمرم. ترسی من لەو گوناحانەیە کەبەردەوام دەگەن.

عەلی بۆ پەرەستاری کردنی ئەو هات و لەسەر سەری دانیشت. عەبداللە کوڕی عەباس هات و وەسفی کرد. عومەر پێی وت: ئەی کوڕی عەباس، تۆیش من وەسف دەکەیت؟

عەلی ئیشارەی کرد تا بڵێ، بەڵێ. کوڕی عەباس وتی: بەڵێ. عومەر وتی: تۆ و هاورێکانت ناتوانن من فریو بدەن. دواتر وتی: ئەی عەبداللە، سەرم لەسەر سەرینەکە هەڵگرە و بیخەرە سەر زەوی، ئەگەری هەیە خوای گەورە سەیرم بکات و بمبەخشێت. سوێند بەخوا ئەگەر سامانی ئەم پانتاییە کەخۆر لەسەەری دەدرەوشێت، هی من بوایە، بۆ خۆ دورخستنەوە و باشبونەوە بەترس لەمردن و رۆژی کۆتاییم دەبەخشی.

پزیشکێکیان لەبەنی حەرەس کوڕی کەعب هێنا. دەرمانێکی دەرخوارد دا کەهێشتا نەیخواردبو، هێنایەوە. شیری دەرخوارد دا و بەهەمان شێوە هێنایەوە. پزیشك وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران وەسیەتی خۆت بکە. عومەر وتی: ناسودە بوم.

کاتێك، کاتی مردنی هاتسەری لەداوێنی کوڕەکەی عەبداللە بو. دواتر وتی:

طللوم لنفسی غیر انی مسلم اصلی الصلاة کلها و اصوم

یانی: ستەمکارم لەسەر خۆم جگە لەوەی کەموسوڵمانم و هەمو نوێژەکانم دەخوێنم و رۆژو دەگرم.

بەردەوام بیری خوای گەورەی دەکرد تا ئەوەی لەشەوەی چوارشەممە سێ شەو بۆ کۆتایی زی حەججە ساڵی بیست و سێیەمی کۆچی /٦٤٤ زایینی ماڵئاوایی لەجیهان کرد. دەستەیەك دەڵێن: رۆژی چوارشەممە چوار شەو ماوە بۆ کۆتایی مانگی زی حەججە / ٣ نۆڤەمبەری ٦٤٤ زایینی بەکێرد لێیاندا و لەرۆژی یەکی موحەرەمی ساڵی ٢٤ / ٧نۆڤەمبەری ٦٤٤ زایینی ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

رۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەو دە ساڵ و شەش مانگ و هەشت رۆژ بو. لەرۆژی ٣ موحەرەم /٩ نۆڤەمبەر لەگەڵ عوسمان کوڕی عەففان بەیعەتیان کرد. دەستەیەك دەڵێن: مردنی ئەو چوار رۆژ بۆ کۆتایی زی حەججە /٢ نۆڤەمبەری ٦٤٤ زایینی و یەك رۆژ بۆ کۆتایی زی حەججە / ٦ مۆڤەمبەری ٦٤٤ زایینی لەگەڵ عوسمان بەیعەتیان کرد و ئەو رۆژی یەکی موحەرەمی ساڵی بیست و چواری کۆچی / ٧ نۆڤەمبەری ٦٤٤ زایینی خەلافەتی دەست پێکرد. لەسەر بنەمای ئەم وتە، ماوەی خەلافەتی عومەر دە ساڵ و شەش مانگ و چوار رۆژە. صوهەیب نوێژی لەسەر خوێند. ئەویان هەڵگرت و بردیانە ماڵی عایشە و لەپاڵ پێغەمبەر(ص) و ئەبوبەکر بەخاکیان سپارد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زوبەیر کوڕی عەوام و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و عوسمان کوڕی عەففان و سەعد کوڕی

وەقاس و عەبدالله کوڕی عومەر ڕۆشتنە ناو ئارامگاکەی ئەو.

## نەژاد و تایبەتمەندیەکان و ژیانی عومەر کوڕی خەتاب

نەژادنامەکەی بەمشێوەیە: عومەر کوڕی خەتاب کوڕی نوفەیل کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی ریاح کوڕی عەبدالله کوڕی قرت کوڕی زەراع کوڕی عودەی کوڕی کەعب کوڕی لوئەی. نازناوەکەی باوکی حەفصە و دایکی حەنتەمە کوڕی هشام کوڕی موغەیرە کوڕی عەبدالله کوڕی عومەر کوڕی مەخزوم. ئەو کچە مامی ئەبوجەهلە. ئەوانەی شارەزاییان نیە، گومان دەکەن دایکی ئەو خوشکی ئەبوجەهلە. ئەم وتەیە هیچ بەهایەکی نیە.
پێغەمبەر(ص) ئەوی بە(فاروق) جیاکەرەوەی راستی لەچەوتی، ناو دەبرد. دەستەیەك دەڵێن: خاوەنانی کتێب ئەویان بەفاروق ناو بردوە.
تایبەتمەندیەکانی ئەو بەم شێوە بون: پیاوێکی باڵابەرز، گەنم رەنگ، سەرێکی تاس، چەپ دەست، بازو کراوە (بەهەر دو دەست کاری دەکرد)، ئەوەندە باڵای بەرز بو کاتێك رادەوەستا، گومانیان دەکرد، سوارەیەکە. دەستەیەك دەڵێن: سپی بو، زۆر سپی. کەمێك سورباو، باڵا بەرز، سەرێکی بێ مو، ریشێکی درێژ و سپی و جوان. ریشی بەرەنگی زەرد رەنگ دەکرد و سەری شانە دەکرد. رۆژی لەدایك بونی چل ساڵ پێش شەڕی فەجار بو و ساڵەکانی ژیانی ٥٥ ساڵ. دەستەیەك دەڵێن: شەست ساڵ تەمەنی بو و دەستەیەك دەڵێن: شەست و سێ ساڵ. راستیەکەی ئەوەیە ( ٤٠ ساڵ پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر(ص) چاوی بەدونیا هەڵهێنا). دەستەیەك دەڵێن: شەست و یەك ساڵی بو.

## ناوی کوڕەکان و ژنەکانی عومەر

عومەر لەرۆژگاری جاهلی لەگەڵ زێنەب کچی مەزعون کوڕی حەبیب کوڕی وەهب کوڕی حوزافە کوڕی جومەح پەیوەندی هاوسەری بەست و ئەم ژنە عەبدالله و عەبدولرەحمانی گەورە و حەفصەی بۆ هێنایە دونیا.
هەروەها لەرۆژگاری جاهلی مولەیکە کچی جەروەلی خوزاعی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد کەعوبەیدالله کوڕی عومەری بۆ هێنایە دونیا. لەرۆژگاری (شەڕی بەس) لێی جیابویەوە و ئەم ژنە بوبەهاوسەری ئەبو جەهم کوڕی حوزەیفە. عوبەیدالله لەشەڕی

صەفین لەناو سوپاکەی معاویە کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: دایکی ئەم عوبەیداللەیە دایکی زەیدی گەورە دایکی کولسوم کچی جەروەلی خوزاعی بو. ئیسلام جیایی خستە نێوان ئەو و عومەر.

هەروەها قورەیبە کچی ئەبوئومەییەی مەخزومی لەرۆژگاری جاهلی کردە هاوسەری خۆی و لەکاتی شەڕی بەس لێی جیابویەوە. دوای ئەو عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر ئەم ژنەی کردە هاوسەری خۆی. ئەم دوانە هەردوکیان( عومەر و عەبدولرەحمان) ئاوەڵزاوای پێغەمبەر(ص) بون چونکەقورەیبە خوشکی دایکی سەلمە هاوسەری پێغەمبەر(ص) بو.

هەروەها عومەر دایکی حەکیم کچی حەرەس کوڕی هشامی مەخزومی لەرۆژگاری جاهلی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد

و ئەم ژنە بۆ ئەو فاتیمەی هێنایە دونیا. عومەر لێی جیابویەوە. دەستەیەك دەڵێن: لێی جیانەبویەوە.

هەروەها جەمیلە خوشکی عاصم کوڕی سابتی کوڕی ئەبی ئەقلەحی ئەوسی ئەنساری وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و ئەم هاوسەرگیریە لەرۆژگاری ئیسلامیدا بو. ئەم ژنە عاصمی بۆ هێنایە دونیا و عومەر دواتر لێی جیابویەوە.

دواتر دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالبی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد کەدایکی، فاتیمە کچی پێغەمبەر(ص)ی خوا بو. عومەر بەم ژنە چل هەزار درەمی وەك مارەیی بەخشی. دایکی کولسوم زەید و روقیەی بۆ هێنایە دونیا. هەرەها لۆهەیە(ژنێکی یەمەنی) کردە هاوسەر کەعەبدولرەحمانی نێوەنجی بۆ هێنایە دونیا. دەستەیەك دەڵێن: عەبدولرەحمانی گەورەی بۆ هێنایە دونیا. دەستەیەك دەڵێن: ئەم ژنە ((دایکی منداڵ) (ام ولد) بو.

هەروەها ماڵەکەی ئەو فۆکەیەهەی تیابو کەئەویش (دایکی منداڵ) و زێنەب منداڵترین منداڵی عومەری هێنایە دونیا.

لەگەڵ عاتیکە کچی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیل پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەم ژنە پێشتر لەماڵی عەبداللە کوڕی ئەبی بەکری راستگۆبو و لەکاتێکدا کەئەم ژنە لەماڵەکەیدا بو، عەبداللە کوژرا. کاتێك عومەر مرد، زوبەیر کوڕی عەوام ئەوی وەك

هاوسەری خۆی هەڵبژارد. زوبەیریش لەکاتێکدا هاوسەری ئەم ژنە بو، کوژرا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب خوازبێنی لێکرد. ژن وتی: نابمە هاوسەری تۆ، دەترسم بکوژرێیت تۆ تەنیا کەسێکی گەورەییت کە لەناو بەرێزەکاندا ماویتەوە. عەلی دەستی لێ هەڵگرت.

عومەر لەدایکی کولسوم کچی ئەبوبەکری صدیق لای عایشە خوازبێنی کرد. دایکی کولسوم وتی: من پێویستم بەو نیە چونکە پیاوێکە بەژیانێکی دژوار، و باشیەکەی سەختگیرانە لەسەر ژنان. عایشە کەسی بۆ لای عەمرۆ عاص نارد و داوای رێگە چارەی لێکرد. عەمرۆعاص وتی: من ئەم کێشەیە چارەسەر دەکەم. عەمرۆعاص هاتە لای عومەر و وتی: هەواڵێك بەمن گەیشتوە کەداوات لێدەکەم پەنا بۆ خوا ببەیت. عومەر وتی: کام هەواڵە؟ عەمرۆ وتی: خوازبێنی تۆ لەدایکی کولسوم کچی ئەبوبەکر. عومەر وتی: راستە بەڵام ئایا ئەوت لەمن دورخستەوە یا من لەو؟ عەمرۆ وتی: هیچ کام. کێشەکە لەوەدایە ئەم کچە، تازە پێگەیشتوە و لەژێر سێبەری سەروەری باوەڕداران بەنەرمی و خۆشەویستی گەروە بوە بەڵام تو پیاوێکی توڕە و توشیت و ئێمە بەردەوام لەتۆ دەترسین و ناتوانین عادەتێك لەعادەتەکانی تۆ بگۆڕیین. ئێستا بڕوانە و بزانە چی رودەدات ئەگەر لەکارێکدا لەگەڵ تۆ ناسازگار بێت و تۆ لێی توڕە ببێت و ئازاری بدەیت. ئەوسا سەبارەت بەمناڵەکان و پاشماوەکانی ئەبوبەکر کارێکی شیاوت ئەنجام نەداوە. عومەر وتی: چی لەعایشە بکەم چونکە قسەم لەگەڵ کردوە؟ عەمرۆ وتی: من ئەو کێشەیە چارەسەر دەکەم، کچی باشتر لەو نیشانی تۆ دەدەم، شاجوانی هەمو کچەکانی جیهان، دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەئەگەر لەگەڵ ئەو پەیوەندی هاوسەرگیری ببەستیت، پەیوەندیەکی بەهێزی خزمایەتیت لەگەڵ پێغەمبەر(ص)ی خوادا دروست کردوە.

هەروەها عومەر لەدایکی ئەبان کچی عوتبە کوڕی رەبیعە خوازبێنی کرد بەڵام کچەکە ئەوی پەسەند نەکرد و وتی: بەردەوام لەماڵەکەی خۆیدایە و رێگەی چاکەکردن لەکەسانیتر دەگرێت. روگرژ لەماڵ دەڕواتەدەر و توڕە دەگەڕێتەوە (بەمشێوەیە عومەر، جگە لەکەنیزەکان، هەشت ژنی کردە هاوسەری خۆی)

## کرداری عومەر

عومەر جارێك وتی: داستانی عەرەب لەداستانی وشترێکی چەموش دەچێت کەبەردەوام بەدوای وشترواندا دەڕوات. دەبێت وشترەوانی عەرەبەکان بزانێت بۆ کوێیان دەبات. بەلاّم من، سوێند بەپەروەردگاری کەعبە ئەوان بۆ رێگەی راست دەبەم! نافع ئەلعەیشی دەڵێت: هاورێ لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبی تالیب رۆشتینە ناو ئەو بێستانانەی وەك زەکات وەرمان گرتبو. عوسمان لەسێبەرێك دانیشت و دەستی بەنوسین کرد و عەلی لەسەر سەری وەستا و ئەوەی عومەر دەیوت، بۆی دەخوێندەوە. عومەر لەو رۆژە زۆر گەرمەدا لەبەردەم هەتاوەکەدا وەستابو، دو رۆپۆشی رەشی پێوە بو یەکیان جەستەی پێ داپۆشیبو یەکیان سەری و وشترە زەکاتیەکانی سەرژمێری دەکرد و رەنگی ئەوانی دیاری دەکرد و دانەکانی دەژماردن. عەلی بەعوسمانی وت: لەنوسراوی خوادا هاتوە: ئەی باوکە، ئەو بەکرێ بگرە، چونکە باشترین کەس کەبەکرێی دەگرییت، پیاوێکە کەبەهێز و راست کردار بێت (قصص/٢٨/٢٦). عەلی بەدەستی خۆی عومەری نیشاندا و وتی: ئەوە هەمان پیاوی بەهێز و راست کردارە.

عەبدالله کوڕی عامر کوڕی رەبیعە دەڵێت: عومەرم بینی کەمشتێ کای لەسەر زەوی هەلگرت و وتی: خۆزگە من ئەم مشتە کایە دەبوم، خۆزگە هیچ نەدەبوم، خۆزگە لەبیرکراوی لەبیرکراو دەبوم، خۆزگە دایك منی نەدەهێنایە دونیا. حەسەن دەڵێت: عومەر وتی: ئەگەر زیندو بمێنم، بەخواستی خوا یەك ساڵ لەناو چینە جیاوازەکانی خەڵك بەگەڕان سەرقاڵ دەبم چونکە دەزانم زۆربەی نیازەکانی خەڵك بەمن ناگات چونکە نەفەرمانڕەواکانیان بەمن دەڵێن و نەخۆیان دەتوانن دەستیان بەمن بگات. بەشێوەیەك دەڕۆم کە لەشام دومانگ بمێنمەوە، لەجەزیرە دو مانگ، لەمیسر دو مانگ، لەبەحرەین دو مانگ، لەکوفە دو مانگ و لەبەسرە دو مانگ. سوێند بەخوا ساڵێکی خۆش دەبێت. بەعومەریان وت: لەئەنبار پیاوێکی لێیە و شارەزای کاروباری دیوانە، باشترە ئەو وەك دەبیری خۆت هەڵبژێری. عومەر وتی: ئەگەر ئەم کارە بکەم رازدارێکی دور لەخەڵکم دەست نیشان کردوە.

دەستەیەك دەڵێن: عومەر بۆ خەڵك وتاریدا و وتی: سوێند بەو کەسەی محەممەدی

بەراستی و دروستی نارد، ئەگەر وشترێك لەكەنارەكانی فورات لەناو بچێت، لەوە دەترسم خوا لەسەر ئەو بابەتە لێكۆڵینەوە لەگەڵ من بكات.

ئەبو فوراس دەڵێت: عومەر وتارێكدا و وتی: فەرماندارانیان بۆ سەر ئێوە رەوانە نەكردوە كە لەئێوە بدەن و سامانەكانتان بگرن. بۆ ئەم مەبەستە رەوانەی لای ئێوەیان كردون تا دین فێری ئێوە بكەن و شێوەی ژیانی پێغەمبەر(ص)تان بیر بێننەوە. هەركەس هەڵس و كەوتێكی جیاواز لەمە لەفەرمانڕەواكان ببینێت، دەبێت منی لێ ئاگادار بكاتەوە، سوێند بەو كەسەی گیانی عومەر لەدەستی ئەودایە، تاوان و سزای ئەم كارە بەسەر بێدادگەر و بكەرەكەی دەسەپێنم. عەمرۆ كوڕی عاص لەشوێنەكەی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بیر لەوە بكەرەوە كەئەگەر یەكێك لەفەرمانڕەواكان یەكێك لەژێردەستەكانی خۆی بەشێوەیەك تەمێ بكات، ئایا تۆ ئەو سزا دەدەیت؟ عومەر وتی: بەڵێ، سوێند بەو كەسەی گیانی عومەر لەدستی ئەودایە، سزای دەدەم. پێغەمبەر(ص)ی بەرێزم بینی، سزا و تاوانی لەسەر خۆی دیاری دەكرد! ئاگادار بن لەموسوڵمانەكان نەدەن كەریسوا و سوك بن، ئەوان وەسف مەكەن كەگیرۆدەی پرێشانی ناخ بن، پێویستی و خواستەكان لەوان درێغ مەكەن كەناچاریان بكەن ناباوەڕ بن و ئەوان بۆ ناو دارستانەكان رێنوێنی مەكەن كەبەفیرۆیان دەدەن.

بەكر كوڕی عەبدالله دەڵێت: عومەر كوڕی خەتاب رۆشتە لای عەبدولرەحمان كوڕی عەوف و بینی لەتاریكایی شەو لەناو ماڵەكەی خۆی نوێژ دەخوێنێت. عەبدولرەحمان لێی پرسی: بۆ لەم كاتژمێرە لەشەو لەماڵ هاتویتە دەر؟ عومەر وتی: چەند كەسێكم بینی كەهاورێ و هاوەڵان یا خزمانی یەكترن و لەسوچێكی بازار دابەزین. ترسام دزەكانی مەدینە زیانیان لێ بدەن یا شتێك لەوان بڕفێنن. با پێكەوە بڕۆین و پارێزگاریان لێ بكەین. ئەوان رۆشتنە بازار و لەسەر سەكۆیەك دانیشتن و دەستیان بەگفتوگۆ كرد. لەم كاتەدا ئەو دوانە چرایەكیان بینی. عومەر وتی: مەگەر فەرمانم نەدابو دوای گەشتنی كاتی خەو، چرا هەڵمەكەن. عومەر و عەبدولرەحمان بەرێكەوتن و بینیان دەستەیەك دانیشتون و شەراب دەخۆن. عومەر وتی: بابڕۆین ناسیمەوە! كاتێك بەیانی داهات، كەسی بەدوایدا نارد و بانگی كرد و پێی وت: ئەی فلان كەس دوێ شەو لەگەڵ هاورێكانت لەسەر سفرەی شەراب بویت! پیاو وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران تۆ

لەکوێوە دەزانیت؟ عومەر وتی: بەچاوی خۆم بینیم. ئەو پیاوە وتی: مەگەر خوا تۆی لەشوێنکەوتن بەدوای کاروباری خەڵك دورنەخستۆتەوە؟ (حجرات٤٩/١٢) عومەر لێی خۆشبو.

بۆیە داگیرساندنی چرای بەنارەوا لەقەڵەم دا چونکە مشکەکان پلێتەی چراکانیان هەڵدەگرت و دەیانبردە سەر بانی ماڵە دارین و قامیشیەکانی ئەوسا و دەبونە هۆی ئاگرکەوتنەوە. زۆربەی ماڵەکانیش بەبەرگ و گەڵای خورما دروست دەکران. پێغەمبەر(ص)یش پێشتر خەڵکی لەم کارە بەدور دەگرت.

ئەسلەم دەڵێت. عومەر بەرەو زەویەکی بەردەلآن و ڕەش بەناوی (واقم) ڕۆشتەدەر و من هاورێیەتیم دەکرد. کاتێك گەشتینە دیوار بەستی صەرار، بینیمان، ئاگرێك هەڵگیرساوە. بەڕاکردن ڕۆشتین و گەشتینە نزیك ئەوان و بینیمان ژنێکە لەگەڵ منالەکانی خۆی لەدەوری ئاگرەکە کۆبونەتەوە. قازانێك لەسەر ئاگردکەیە و ئاگر لەژێر قازانەکە بلێسە دەسەنێت و منالەکان لەبرسیەتیدا هاوار دەکەن. عومەر وتی: سلآو لەئێوە ئەی خواوەندانی روناکی. نەیویست بلێت: خواوەندانی ئاگر (ئەگەر دەیوت، ماناکەی بەزمانی عەرەبی (یا اصحاب النار) دەبویە، ئەی جەهەننەمیەکان) ژن وتی: سلآو لەتۆ بێت. عومەر وتی: بێینە پێش؟ ژن وتی: بەباشی وەرە پێش وەگەرنە بەجێمان بێڵە. عومەر ڕۆشتە پێش و وتی: ئێوە چیتان بەسەر دێت؟ ژن وتی: شەو و سەرما ئێمەی داماو کردوە. عومەر وتی: بۆ ئەم منالآنە بەمشێوەیە هاوار دەکەن؟ ژن وتی: لەبرسانا. عومەر وتی: ئەو قازانە چی تیایە؟ ژن وتی: هیچم نیە ئەوانی پێ بێدەنگ بکەم، لەبەر ئەمە ئەوان بەنەرمی گەرم رادەگرم و وایان نیشان دەدەم کەخەریکم شتێکیان بۆ دروست دەکەم تا خەویان لێ بکەوێت. خوا لەنێوان ئێمە و عومەر داوەری بکات! عومەر وتی: خوا لێت خۆش بێت! عومەر چوزانێت ئێوە لەم بارودۆخەدا بەسەر دەبەن؟ ژن وتی: کاروباری ئێمەی گرتۆتە دەست و ئێمەی لەبیر کردوە. عومەر روی کردە من و وتی: لەگەڵ من وەرە. هاتینەدەر و رامان کرد تا گەشتینە ئەنباری ئارد. ئەو لابارێکی هەڵگرت کەئارد و گۆشت و چەوری تیا بو. بەمنی وت: بارەکە بخەرە سەر پشتم. ئەسلەم دەڵێت: پێم وت: من بۆت دێنم. دو یا سێ جار وتم. عومەر لەکۆتاییدا وتی: ئایا لەرۆژی هەستانەوەیش باری گوناحەکانم بۆ

هەڵدەگریت ئەی بێ دایك؟ بارەکەم خستە سەر پشتی ئەو. بەرێکەوت و بەدوایدا بەرێکەوتم و هەردوك بەراکردن تا گەشتینە لای ئەو ژنە. بارەکەی لای ژنەکە خستە سەر زەوی و ئەندازەیەك ئاردی دەرهێنا و بەو ژنەی وت: ئاردەکە بەسەر من بپرژێنە تا بۆ تۆ گەرمی بکەم. عومەر فوی لەژێر قازانەکە کرد. ریشی درێژ و پڕبو. دەمبینی دوکەڵ لەناو ریشی دێتەدەر. خواردنەکەی دروست کرد. ژن بۆ عومەر سینیەکی هێنا و خواردنە دروست کراوەکەی خستە سەر و وتی: من بەردەوام ئامادە دەکەم و تۆ خواردن بەوان بدە.ئەو کارەی کرد تا هەمویان تێر بون و پاشماوەکەی لای ژنەکە دانا و هەستا و من لەگەڵی هەستام. ژن بەردەوام دەیوت: خواوەند جەزای چاکەت بداتەوە! تۆ بۆ خەلافەت باشتری لەسەروەری باوەڕداران! عومەر وتی: قسەی باش بکە کەئەگەر بڕۆیتە لای سەروەری باوەڕداران بەخواستی خوا من لەوێ دەبینیت. دواتر رۆشتە سوچێك و روی کردە ژنەکە و لەسەر زەوی دانیشت و لەگەڵ من قسەی نەکرد تا بینی منداڵەکان پێدەکەنن و هەڵبەز و دابەز دەکەن. دواتر هەمویان ئارامیان گرت و خەویان لێکەوت. عومەر هەستا و بەردەوام سوپاسی خوای دەکرد. وتی: ئەی ئەسلەم برسیەتی ئەوانی بەئاگا و بێ قەرار و گریان کردبو. ویستم نەگەڕێمەوە تائەوەی بینیم، بەجوانی بیبینم.

سالم کوڕی عەبدالله کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێك عومەر رێگەی کارێکی لەخەڵك دەگرت، کەسان و بنەماڵەکەی خۆی کۆدەکردەوە و دەیوت: من رێگری فلان کار و فیسار کارم لەخەڵك گرت. خەڵك بەهەمان شێوە کەمریشك سەیری گۆشت دەکات، سەیری ئێوە دەکەن. سوێند بەخوا ئەگەر ببینم یەکێك لەئێوە ئەو کارانە ئەنجام دەدات، دوبەرابەر سزای دەدەم.

سەلام کوڕی مسکین دەڵێت: کاتێك عومەر نیازمەند دەبو، دەڕۆشتە لای ئەنبارداری گەنجینە و قەرزی لێ وەردەگرت. زۆر جار دژواری پێشدەهات و ئەنباردار دەڕۆشت و داوای قەرزەکەی دەکرد و پێوەی دەلکا. عومەر بەنەرمی داوای مۆڵەتی لێدەکرد و کاتێك سەری مانگ دەهات، قەرزەکەی دەگەڕاندەوە.

دەڵێت: ئەو یەکەم کەس بو بە(سەروەری باوەڕداران) ناوبرا. بەمشێوە بو کاتێك عومەر دەهاتە سەر کار، پێیان دەوت: ئەی جێگری جێگری پێغەمبەر(ص)ی خوا. عومەر وتی:

ئەمە بەردەوام دەبێت و کاتێك یەکێکی دیکە بێتەسەر کار، دەڵێن: ئەی جێگری جێگری جێگرەکەی پێغەمبەر(ص)ی خوا، ئێوە باوەڕدارانن و من سەروەری ئێوەم. لەبەر ئەمە ئەویان بەسەروەری باوەڕداران ناوبرد.

یەکەم کەس بو بناغەی مێژووی ئیسلامی دارشت.

یەکەم کەس بو گەنجخانەکانی دروست کرد.

یەکەم کەس بو شەوانە دەگەڕا، یەکەم کەس بو سزای لەسەر خراپە وتن لەوتاردان دیاری کرد. یەکەم کەس بو رێگری لەفرۆشتنی (دایکی منالآن) (امهات الولد) کرد، یەکەم کەس بو خەڵکی بۆ چوار جار تەکبیر وتن لەسەر مردو کۆکردەوە. پێش ئەو بەچوار یا پێنج یا شەش تەکبیر نوێژی مردویان دەخوێند. واقا ی بەمشێوەی گێڕاوەتەوە.

یەکەم کەس بو خەڵکی لەدەوری یەك پێشنوێژ کۆکردەوە کە لەمانگی رەمەزان بەنوێژە پەسند کراوەکان دوای نوێژ خەوتن (تەراوێح) سەرقاڵ بن. نامەی بۆ شارەکان نوسی و فەرمانی بەخەڵکدا ئەم کارە بکەن.

یەکەم کەس بو قامچی بەدەستەوە گرت و لەناو خەڵکدا گەڕا و ئەگەر خراپەی دەدەی، بەقامچی لەخراپەکاری دەدا.

یەکەم کەس بو لەئیسلام دەستی بەنوسین کرد.

زادان دەڵێت: عومەر بەسەلمانی وت: من پاشام یا خەلیفە؟ سەلمان پێی وت: ئەگەر یەك درەم یا کەمتر یا زیاتر لەسامانی موسوڵمانان هەڵگریت، پاشایت و خەلیفە نیت. عومەر دەستی بەگریان کرد.

ئەبوهورەیرە دەیوت: خوا لەکوڕی حەنتەمە خۆش بێت! ئەوم لەساڵی خۆڵەمێش بینی کەدو هەمانەی لەسەرشان و مەشکەیەك رۆنی بەدەستەوەیە و لەگەڵ ئەسلەم لەناو خەڵکدا دەگەڕێت. کاتێك منی بینی، وتی ئەی ئەبوهورەیرە، لەکوێوە دێیت؟ وتم: لەشوێنێکی نزیك. بەدوای ئەودا بەرێکەوتم. باردەکەیم هەڵگرت تا گەشتینە صەرار و نزیکەی بیست بنەماڵە لەهۆزی محاربمان بینی. عومەر پرسی: چ شتێك ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە؟ وتیان: دەست کورتی. پێستێکی مرداریان دەرهێنا کەبرژاندیان و خواردیان. ئێسقانی رزاویان دەرهێنا کەئاردیان کرد و خواردیان. بینیم، دەستبەجێ

عومەر ڕۆپۆشەکەی خۆی فرێدا و بەریەخەی بەست و نانی بۆ دروست کردن تا هەموانی تێر کرد. دواتر ئەسلەمی بۆ مەدینە نارد کەچەند وشترێکی هێنا وئەوانی سوار کرد تا گەشتنە (حوبانە) و جل وبەرگی لەبەر کردن. بەردەوام هاتوچۆی ئەوانی دەکرد تا خوا ئەو سەختی و بەدبەختیەی هەڵگرت.

ئەبو خەیسەمە دەڵێت: (شفا )کچی عەبداللە چەندین گەنجی بینی کەئارام بەرێگادا دەڕۆن و لەسەر خۆ قسە دەکەن. پرسی: ئەوان بەچیەوە سەرقاڵن؟ وترا: ئەوان خۆپارێزەکانن. وتی: سوێند بەخوا عومەر بەمشێوە بو، کاتێك قسەی دەکرد، دەیگەیاند، کاتێك بەرێگادا دەڕۆشت، پەلەی دەکرد و کاتێك لەکەسێکی دەدا، ئازاری پێدەگەیاند. سوێند بەخوا خۆپارێزی راستەقینە ئەو بو.

حەسەن دەڵێت: عومەر وتاری بۆ خەڵك دەدا و پێڵاوێکی لەپێدابو، دوانزە پینەی پێوە بو وپینەیەکیان لەپێست. باوکی عوسمانی نەهدی دەڵێت: عومەرم بینی رەجمی شەیتانی دەکرد و پێڵاوێکی لەپێدا بو بەپێستە پینەکرابو. عەلی دەڵێت: عومەرم بینی بەدەوری کەعبەدا دەسورێت و پێڵاوێکی لەپێدایە کەبیست و یەك پینەی پێوەبو.

حەسەن دەڵێت: عومەر دەگەشتە ئایەیەك لەئایەکانی قورئان کەزیاد لەرادەی پەیوەستی بو و ئەوسا لەخوێندنەکەی دەکەوتە سەر زەوی بەشێوەیەك وەك نەخۆشەکان پەرەستاریان لێدەکرد. دەستەیەك دەڵێن: گوێی لەقورئان خوێنێك بو کە سورەی (طور) دەخوێنێت. کاتێك گەشتە ئەم ئایە کەخوای گەورە دەفەرمێت (ئەشکەنجەی پەروەردگاری تۆ بێ گومان دەگات، کەس ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە ). (گور ٥٨/٨-٧) کەوتە سەرزەوی و بردیانەوە بۆ ماڵەوە. یەك مانگ نەخۆش بو ئەمە لەترسی ئەو ئایە بو. شەعبی دەڵێت: عومەر لەبازاردا دەگەڕا و قورئانی دەخوێند و لەهەر شوێنێك کەسێك داوەری دەبردە لای ئەو، ئەو کارەی ئەنجام دەدا.

موسا کوڕی عەقەبە دەڵێت: چەند کەسێك هاتنە لای عومەر وپێیان وت: نانخۆرەکانمان زۆر و خەرجیمان قورس بوە. بەخششەکانی ئێمە زیاد بکە. عومەر وتی: خۆتان کردتان. ژنی زۆرتان کردە هاوسەر و نۆکەری زۆرتان هێنایە ناو ماڵ. هەموی ئەمانەتان لەسامانەکانی خوا کرد. حەزم دەکرد من و ئێوە لەناو کەشتیەك لەگێژاوێکی تۆفاناوی دەریا دەبوین کەئێمەی بۆ رۆژهەلات و رۆژئاوا دەبرد. خەڵك ناچار دەبون کەسێك وەك

لێپرسراوی خۆیان دیاری بکەن کەئەگەر بەرێگەی راستدا بڕوات، شوێنی کەون و ئەگەر بەلارێدا بڕوات، بیکوژن. تەڵحە وتی: بۆچی نەتوت، ئەگەر بەلارێدا بڕوات، ئەو لەسەر کار لابەرن؟ وتی: لەئاوا کاتێك کوژران خراپترین کار نیە. لەجوامێری گەورەزادەی قورەیش خۆتان بەدور بگرن کەتەنیا بەرەزامەندی دەخەوێت و لەکاتی تورەیی بزە دێنێتە سەر لێو و پارێزگاری لەژێردەستەکان و بالأدەستەکان دەکات.

موجالد دەڵێت: لای عومەر باسی پیاوێکیان کرد و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو زانایەکە لەخراپە هیچ نازانێت. عومەر وتی: ئەمە زیاتر هۆکاری هەڵە و کەوتنی ئەوە.

صالح کوڕی کیسان دەڵێت: موغەیرە کوڕی شەعبە وتی: کاتێك عومەر بەخاك سپێردرا، ڕۆشتمە لای عەلی، چونکە حەزم دکرد لەو سەبارەت بەعومەر شتێك ببیستم. عەلی هاتەدەر و سەر و ریشی پەرێشان بو چونکە خۆی شۆردبو و جل وبەرگێکی رازاوەی لەبەر کردبو لەبەر ئەوەی گومانی دەکرد فەرمانڕەوایەتی موسوڵمانان دوای عومەر بێ گومان بەو دەگات. وتی: خوا لەکوڕی خەتاب خۆش بێت. کچی ئەبی خەسمە (حەنتەمە) راستی دەکرد کەعومەر چاکەکانی خەلافەتی لەگەڵ خۆی برد و لەخراپەکان رزگاری بو. سوێند بەخوا ئەم قسەی نەکرد بەڵکو بۆیان دروست کرد.

عاتکە کچی زەید کوڕی عەمرۆ سەبارەت بەعومەر وتی:

| | |
|---|---|
| وفجعنی فیروز لا در درە | بابیض تال للکتاب نجیب |
| رؤوف علی الادنی غلیظ علی العدا | اخی ثقة فی النائبات منیب |
| کتی ما یقل لا یکذب القول فعله | سریع الی الخیرات غیر قطوب |

یانی:

فیروز(بکوژەکەی عومەر) کەخوا پیرۆزی لەو دور بخاتەوە، منی داغداری پیاوێکی بەختەوەر کرد کەخوێنەری نوسراوی خوا بو و پیاوێکی خاوەن نەژاد، مێهرەبان لەگەڵ ژێردەستەکان، توند لەگەڵ دوژمنان، پیاوێکی شیاوی پشت پێ بەستن لەکاتی پێشهاتنی بەدبەختیەکان، رو لەخوا. هەر کات قسەی دەکرد، کرداری وتاردکەی بەدرۆ نەدەخستەوە، بەرەو باشیەکان بەپەلە دەڕۆشت و روگرژ نەبو.

هەروەها ئەم ژنە وتی:

| | |
|---|---|
| عين جودى بعبرة و نجيب | لا تملى على الامام النجيب |
| فجعتنى المنون بالفارس المعـ | ـلم يوم الهياج و التلبيب |
| عصمه الناس و المعين على الدهـ | ـر و غيث المنتاب و المحروب |
| قل لا هل الثراء و البوس موتوا | قد سقته المنون كاس شعوب |

یانی: ئەی چاوەکانی من، بەفرمێسك و گریان فریای من کەون و بەمنی ببەخشن. رێگە مەدە هیلاك بیت و لەسەر رێبەری گەورە بەردەوام بارانی فرمێسك ببارێنە. مەرگ منی داغداری شەرکەرێکی دیاری کرد کەلەرۆژی شەڕ و دەرگیری ئازا و نوێرەکان، کارە بەرچاوەکانی لەخۆی نیشان دەدا. پەناگا و پشتیوانی خەڵك بو، هاورێی ئەوان بو لەبەرابەر بێدادی رۆژگارەکان، باران بو بۆ گرفتارانی وشکەساڵی و بەدبەختیەکان. لەهەژاران و دەست کورتەکان بپرسە کەمەرگ شەرابێکی گیانبڕی دەرخوارددا.

کوڕی موسەییب دەڵێت: عومەر حەجی کرد و کاتێك گەشتە زەجنان، وتی: خوایەك جگە لەخوا نیە کەگەورە و لەپێش و بەخشەری هەر شتێکە بەهەر کەس کەخۆی بیەوێت. من وشترەکانی خەتابم لەم دۆڵەدا دەلەوەڕاند و جلێکی ئەستور و پەشمینم لەبەردابو. باوکی من پیاوێکی تورە بو، کاتێك کارم دەکرد، شوێنم دەکەوت و ئەگەر کەمتەرخەمیمم دەکرد، لێیدەدام و ئازاری دەدام. ئێستا گەشتومەتە جێگەیەك لەنێوان خۆم لەگەڵ خوا کەس نابینم. دواتر ئەم قسەی هێنایە سەرزمان.

| | |
|---|---|
| لا شیء فيما ترى تبقى بشاشته | يبقى الاله و يودى المال و الولد |
| لم تغن عن هرمز يوما خزائنه | و الخلد قد حاولت عاد فما خلدوا |
| ولا سليمان اذ تجرى الرياح به | و الانس و الجن فيما بينها يرد |
| اين الملوك التى كانت نوافلها | من كل اوب اليها راكب يفد |
| حوضا هنالك مورودا بلا كذب | لابد من ورده يوما كما وردوا |

یانی:

هیچ دیاردەیەك نیە سەرسەوزی و شادیەکەی بەردەوام بێت. خوا دەمێنێتەوە و سامان و منداڵەکان بەرەو لەناو چون دەڕۆن. ئەو رۆژە گەنجەکان فریایی هورموز نەکەوتن. و خەڵکی عاد هەوڵیاندا نەمر بمێنەوە و نەمانەوە. و نە سلێمان کەبا لەفەرمانی ئەودا بو و خەڵکان وپەریەکان دەستەمۆی. بۆ کوێ رۆشتن ئەو پاشایانەی لە هەر سوچ و

کەنارێکەوە سوارەکان سامانەکانیان بۆ دەهێنان و دیلەکانیان بۆ ئەوان دەهێنا.
ئاوگرێك (حەوز) لەم ناوەدایە کە بەراستی (نەك درۆ) بەناچاری هەموان دەڕۆنە ناوی، بەهەمان شێوە کەپێشینان ڕۆشتنە ناوی.
ئەسلەم دەڵێت: هند کچی عەتبە لەعومەر لەگەنجخانە چوار هەزار درەمی بەقەرز وەرگرت تا بازرگانی پێوە بکات و پێبەندی دانەوەی بێت. ژن ئەو زێرەی بۆ سەرزەمینی کەلب برد و ئاڵوگۆڕی پێوە کرد. بیستی کەئەبوسوفیان و کوڕەکەی عەمرۆ ڕۆشتونەتە لای معاویە. ژن ڕۆشتە لای. ئەبو سوفیان لێی جیاببویەوە. معاویە پێی وت: ئەی دایە بۆ چ کارێك هاتویت؟ هند وتی: کوڕەکەم بۆ ئەوەی تۆ ببینم. خۆ عومەر دەناسی، بۆ خوا کار دەکات. ئێستا باوکت هاتۆتە لای تۆ و دەترسم هەمو شتێك بەو بدەیت( ئەو شیاوە بۆی) بەڵام خەڵك نازانن ئەمانەت لەکوێ هێناوە و تۆ سەرکۆنە دەکەن و عومەریش تۆ سەرکۆنە دەکات و هیچ کات لەگوناحەکەت خۆش نابێت. معاویە بۆ باوك وبراکەی سەد دینار و جل وبەرگ و چوارپێی سواری نارد. عەمرۆ وتی: ئەمانە دەتوانێت ببێتە هۆی توڕە بونی عومەر. ئەبوسوفیان وتی: ئەمانە بەهۆکاری توڕەبونی عومەر هەژمار مەکە. ئەم بەخششێك بو لەبەرچاوی هند ئەنجام درا. هەمویان گەڕانەوە. ئەبوسوفیان بەهندی وت: قازانجت دەسکەوت؟ هند وتی: خوا باشتر دەزانێت. کاتێك هند گەڕایەوە مەدینە و کاڵاکانی فرۆشت، لەو باجەی لێیان سەند، گلەیی کرد. عومەر وتی: ئەگەر لەسامانی خۆم بوایە، بەتۆم دەبەخشی بەڵام ئەمە سامانی موسوڵمانەکانە. عومەر پێی وت: معاویە تاچەندە دیاری بەئێوە بەخشی؟ ئەبوسوفیان وتی: سەد دینار.
کوڕی عەباس دەڵێت: ڕۆژێك کەعومەر کوڕی خەتاب و هاورێکانی سەبارەت بەوتاردەرەکان گفتوگۆیان دەکرد، یەکێك لەناو ئەوان وتی: فلان کەس باشترینە. یەکێتریان وتی: نا، فلان کەس باشترینە. ڕۆشتمە لای ئەوان. عومەر وتی: ئێستا زاناترینی خەڵك سەبارەت بەم کارە هات. چ کەسێك باشترین وتاردەرە؟ دەڵێت: وتم: زوهەیر کوڕی ئەبی سولی ئەلموزنی. عومەر وتی: یەکێك لەوتەکانی باس بکە تا بۆچونەکەت پشت ڕاست بکاتەوە و ئێمە وەك نیشانەیەك هەژماری بکەین. وتم: دەستەیەك لەخەڵکانی غەتەفانی وەسف کرد و وتی:

لو كان يعقد فوق الشمس من كرم      قوم لاولهم يوما اذا قعدوا

قوم ابوهم سنان حين تنسبهم      طابوا و طاب من الاولاد ما ولدوا

جن اذا فزعوا انس اذا امنوا      ممر دون بها ليل اذا حهدوا

محسرون على ما كان من نعم      لا ينزع الله منهم ما له خسدوا

یانی: ئەگەر لەسەر خۆر و لەپێشتر لەو شێوەیەك ڕێزداری لەئارادابوایە و خەڵكێك كەڵكیان لێوەرگرتایە، ئەوان لەكاتی دانیشتن لەوان لەپێشتر بون. خەڵكێك كاتێك باسی نەژاد بكەن، دەزانرێت باوكیان سەنانە. پاك و خاوێنن ئەو منالآنەی دەیهێننە دنیا، ئەگەر ڕەم بكەن، خەڵكانن و ئەگەر ئاسودەبن، بەهێزەكانن، سەرچاوەی هەمو چاكیەكانن. خەڵك بۆ ئەو شتانەی هەیانە رژدیان پێ دەبەن. بەلآم خواوەند هۆكارەكانی رژدی بردن لەوان وەرناگرێتەوە.

عومەر وتی: سوێند بەخو وتارێكی جوانە. گومان ناكەم كەس لەم هۆزە لەبەنی هاشم بۆ ئەم وەسف كردنە شیاوتر وباشتر بێت و ئەمە لەپیرۆزی پێغەمبەر(ص) و خزمایەتی ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر(ص)ە. وتم: ڕاست ئەكەیت ئەی سەروەری باوەڕداران و بەردەوام بەختەوەریت! وتی: ئەی كوڕی عەباس، ئایا دەزانیت بۆ لەدوای محەممەد ڕێگەی ئەم كارەیان بەئێوە نەدا؟ نەمویست وەلآم بدەمەوە و وتم: ئەگەر نەزانم، سەروەری باوەڕداران من ئاگادار بكاتەوە. عومەر وتی: نەیانویست پێغەمبەر(ص)ایەتی و خەلافەت هەردوكیان بەئێوە بدەن تا بەردەوام لەبەرابەر خەڵك شانازی بەخۆتانەوە بكەن. قوڕەیشیەكان كارەكەی خۆیان هەڵبژارد و بەختەوەر بون. وتم: ئەگەر سەروەری باوەڕداران ڕێگەم بدات قسە دەكەم و ئەگەر لەمن توڕە نەبێت، ئەوەی پێویستە دەهێنمە سەر زمان. عومەر وتی: قسە بكە. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوەی وتت، قوڕەیشیەكان خەلافەتیان بۆخۆیان هەڵبژارد و بەمەبەستەكەی خۆیان گەشتن و بەختەوەر بون، ئەگەر قوڕەیشیەكان بەوەی خوا بۆ ئەوانی دیاری كردبو، ڕازی دەبون، ڕاستی و دروستی لەدەستی ئەوان دەبو و لەوان وەرنەدەگیرایەوە و كەس رژدی پێنەدەبردن. بەلآم ئەوەی كەوتت، نەیانویست پێغەمبەر(ص)ایەتی وخەلافەت هەردوكیان بەئێمە بدەن، خوا خەڵكانێكی بەنەخوازەكان ناوبردوە و فەرمویەتی:

(ئەوەی خوا ناردویەتی، نایانەوێت و کارەکانیان فێرۆ بو و لەناوچو) (محەممەد/٩/٤٧). عومەر وتی: ئەی هاوار، چەندە دورە ئەی کوڕی عەباس! چەندین هەواڵ لەتۆ بەمن گەیشت کەنەمدەویست باوەڕیان پێ بێنم تا پێگەی تۆ لای من دانەبەزێت. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، کام هەواڵانە؟ ئەگەر راست و دروست بن نابێت ببنە هۆی ئەوەی پێگەی من لای تۆ دانەبەزێت و ئەگەر ناڕاست بێت، وەك من کەسێك دەبێت ناڕاستیەکان لەخۆی دور بکاتەوە. عومەر وتی: بەمنیان وتوە کەتۆ دەڵێت: ئەم کارەیان لەروی رژدی بردن و بێداد و ستەم لەئێمە دورکردەوە. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوەی کەوتت: بێداد، بۆ زانا و نەزان ئاشکرا بوە. ئەوەی وتت: لەروی رژدی بردن، رژدیان بەئادەم برد وئێمە منالەکان، رژدی بەری ئەوین. عومەر وتی: راست نیە، راست نیە! سوێند بەخوا ئەی بەنی هاشم، دڵی ئێوە لێوانلێوە لەرژدی و رژدی لێ پاك نابێتەوە. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئارام بە. دڵی خەڵکانێك کەخواوەند پیسی لێ پاك کردۆتەوە و گیان و دڵ و جەستەی ئەوانی خاوێن کردوە، بەرژدی کردن وەسف مەکە. دڵی پێغەمبەر(ص) هاورێی دڵی منالەکانی هاشمە. عومەر وتی: لەمن دورکەوەرەوە ئەی کوڕی عەباس! وتم: ئەو کارە دەکەم. کاتێك ویستم، هەستم، شەرم دایگرت و وتی: ئەی کوڕی عەباس لەشوێنەکەی خۆت دانیشە چونکە من پارێزەری مافەکانی تۆم و هەرشتێك تۆ شادمان بکات، پێمخۆشە. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ لەسەر من و من لەسەر هەر موسوڵمانێك مافێکم هەبە کەهەرکەس بیپارێزێت، گەشتۆتە شوێنی راست و دروست و هەر کەسێك بەفیرۆی بدات، هەڵەی لەسەر بەختی خۆی کردوە. ئەو هەستا و ڕۆشت.

## داستانی راوێژ کردن

عومەر کوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کێردی گیانستێنی بەرکەوت، پێی وترا، باشترە لەدوای خۆت جێگرێك دیاری بکەیت. عومەر وتی: ئەگەر ئەبوعوبەیدەی جەراح زیندو بوایە، وەك جێگری خۆم دیاریم دەکرد و ئەگەر پەروەردگار لەمبارەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردم، دەموت: لەپێغەمبەر(ص)ەکەی تۆم بیست، فەرموی( ئەو ئاگاداری ئەم ئۆمەتەیە). ئەگەر سالم کۆیلەی ئەبو حوزەیفە

زیندو بوایە، وەك جێگری خۆم دەستنیشانم دەكرد و ئەگەر خوا لەمبارەوە پرسیاری لێدەكردم، دەموت: لەپێغەمبەر(ص)ی تۆم بیست كەفەرموی: سالم، خوای گەورەی زۆر خۆش دەوێت. پیاوێك بەعومەری وت: پێشنیار دەكەم كوڕەكەت عەبداللە كوڕی عومەر بكەیتە فەرمانڕەوایی موسوڵمانان. عومەر وتی: خوا تۆ بكوژێت، تۆ ئەم قسەیەت لەڕێگەی خوادا نەكرد! هاوار لەتۆ! چۆن پیاوێك بكەمە جێگری خۆم لەسەر موسوڵمانان كەلەرزگار كردنی ژنەكەی خۆی ناتەوانە. ئێمە پێویستمان بەفەرمانڕەوایی ئێوە نیە. من ئەم كارەم پەسەند نەكرد لەبەر ئەوە خوازیاری ئەوە نیم ئەم كارە بەیەكێك لەبنەماڵەكەی خۆم بسپێرم. ئەگەر باش بو، بەشی خۆمان لێ وەرگرت و ئەگەر خراپ بو، باشتر كەلەئێمە دوركەوتەوە. بنەماڵەي عومەر كوڕی خەتاب ئەوەیان بەسە تەنیا یەك كەسیان لێكۆڵینەوەی لەگەڵ بكرێت و سەبارەت بەئۆمەتی محەممەد پرسیار باران بكرێت. ئاگادار بن، من خۆم خستە ناو ڕەنجەوە و بنەماڵەكەی خۆم لەخۆشیەكانی ژیان بێ بەش كرد. ئەگەر بەشێوەیەك رزگارم بێت كەیەكسان بم یانی نەگوناحێك لەئارادا بێت و نەتوێشوی پاداشتێك، بێ گومان پیاوێكی بەختەوەرم. ئێستا بەباشی دەزانم ئەگەر جێگرێك بۆ خۆم دیاری بكەم، باشتر لەمن كەسێك (وەك ئەبوبەكر) ئەم كارەی كردوە. ئەگەر بێ دیاری كردنی جێگر بمرم، باشتر لەمن كەسێك (وەك پێغەمبەر(ص)) كردویەتی. خوا ڕێگە نادات ئەم دینەی خۆی بەفیڕۆیی لەسەر زەوی بمێنێتەوە.

ئەوان ڕۆشتنەدەر و دواتر گەڕانەوە و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، باشترە یەكێك وەك جێگری خۆت دەستنیشان بكەیت. عومەر وتی: دوای گفتوگۆ لەگەڵ ئێوە بریارمدا ئەندێشەكانی خۆم كۆبكەمەوە تا كاروبارەكانی ئێوەبەكەسێك بسپێرم كەشیاوترینی ئێوەیە و باشتر لەهەر كەسێك دەتوانێت ئێوە بۆ ڕێگەی راست و دروست ببات. ئەو عەلی كوڕی ئەبی تالبی نیشاندا. عومەر دەڵێت: كەمێك خەوتم و پیاوێكم بینی ڕۆشتە ناو بێستانێك و هەر سەوزەیەكی تەڕ و تازە و باڵندەیەكی كۆكردەوە و خستیە ژێر قاچی خۆی. زانیم خوا دەیەوێت كارەكانی خۆی پێش بخات. نەمویست قورساییەكەی لەژیان و مردن لەسەر شان هەڵگرم. ئێستا لەسەر ئێوەیە رو لەدەرگای ئەم كەسانە بكەن كەپێغەمبەر(ص)ی خوا فەرمویەتی، لەبەهەشتیەكانن: عەلی كوڕی ئەبی تالیب،

عوسمان کوڕی عەففان، عەبدولرەحمان کوڕی عەوف، سەعد کوڕی ئەبی وەقاص، زوبەیر کوڕی عەوام و تەڵحە کوڕی عوبەیدالله. دەبێت ئەمانە پیاوێك لەناو خۆیاندا هەڵبژێرن. ئەگەر کەسێکیان دیاری کرد، بەباشترین شێوە پشتیوانی و هاوکاری بکەن.

ئەوان هاتنەدەر. عەباس بەعەلی وت: هاورێیەتی ئەوان بکە. عەلی وتی: دەترسم رێك نەکەوین. عەباس وتی: کەواتە تۆ خوازیاری ئەو کارەیت کەلێی بێزاریت! کاتێك عومەر شەوی گەیاندە بەیانی، عەلی و عوسمان و سەعد و عەبدولرەحمان و زوبەیری بانگ کرد وپێی وتن: بەباشی هەڵسەنگاندنم بۆ ئەم کارە کردوە و ئێوەم بەسەروەری خەڵك زانی. خەلافەت تەنیا لەناو ئێوەدا بێت. پێغەمبەر(ص) کۆچی دوایی کرد لەکاتێکدا لەئێوە رازی بو. ئەگەر لەسەر کارەکەی خۆتان پشتگەرم بن، ترسم نیە لەوەی خەڵك زیان لەئێوە بدەن. ترسی من لەوەیە لەناوخۆتاندا رێك نەکەون و ئەوسا ناسازگاری لەناو خەڵکدا دروست بکەن. هەستن و بەفەرمانی عایشە بڕۆنەماڵەکەی ئەو و لەوێ راوێژ بکەن. عومەر سەری خستە سەرسەرین کەخوێنبەربون بەتەواوی تەڕی کردبو.

ئەوان ڕۆشتنە ژور و بەنەرمی دەستیان بەقسە کردن کرد تا ئەوەی دەنگیان بەرز بویەوە. عەبدالله کوڕی عومەر وتی: پەنا بەخوا، هێشتا سەروەری باوەڕداران نەمردوە .عومەر دەنگ و هاواری ئەوانی بیست، هەستا و وتی: واز لەم کارە بێنن. کاتێك مردم، سێ رۆژ بۆ ئەم کارە راوێژ بکەن و دەبێت لەماوەی ئەم سێ رۆژەدا صوهەیب پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات. نابێت چوارەم رۆژ بێت و یەکێك لەخۆتان بۆ فەرمانڕەوایی هەڵنەبژاردبێت. عەبدالله کوڕی عومەر وەك راوێژکار لەناو کۆڕەکەی ئێوە ئامادە بێت بەلاٚم هیچ بەشێکی لەم کارەدا نەبێت. تەڵحە لەم کارەدا شەریکی ئێوەیە. ئەگەر لەماوەی ئەم سێ رۆژەدا بێت، بۆچونەکەی بەکار ببەن، ئەگەر لەماوەی ئەم سێ رۆژەدا نەهات، درێژە بەکاری خۆتان بدەن. کێیە تەڵحە بێنێتە لای من؟ سەعد کوڕی وەقاص وتی: من دەیهێنم و حەز دەکەم بەخواستی خوا نافرەمانی نەکات. باش دەزانم یەکێك لەم دوانە دەبێتە فەرمانڕەوایی خەڵك، عوسمان یا عەلی. ئەگەر عوسمان بێتەسەر کار، پیاوێکی نەرم و نیان دەبێت و ئەگەر عەلی بێتە سەر کار، گەمە و گاڵتە دەکات بەلاٚم عەلی شیاوترین کەسە تا خەڵك بۆ رێگەی راست و دروست رێنوێنی بکات. ئەگەر ئەم کارە بەسەعد کوڕی وەقاص بسپێرن، بۆئەم کارە شیاوە و گەرنە دەبێت فەرمانڕەوا

داوای هاوکاری لێ بکات چونکە من سستی و ناڕاستیم لێ نەبینی کاتێك ئەوم لەسەر کار لابرد.

عومەر بەئەبو تەڵحەی ئەنساری وت: ئەی ئەبو تەڵحە، ماوەیەکی زۆرە خواوەند ئیسلامی بەئێوە بەخشیوە. پەنجا پیاو لەئەنسار هەڵبژێرە و ئەم شەش کەسە ناچار بکە یەکێك لەناو خۆیاندا دیاری بکەن.

بەمیقداد کوڕی ئەسوەدی وت: کاتێك دەمخەنە ناو گۆڕەکەم، ئەم شەش کەسە لەماڵێکدا کۆبکەنەوە تا کەسێك لەناو خۆیاندا بکەنە خەلیفە.

بەصوهەیبی وت: سێ ڕۆژ لەگەڵ خەڵك نوێژ بکە و ئەم شەش کەسە لەناو ماڵێکدا کۆبکەرەوە و لەسەر سەریان بێستە. ئەگەر پێنج کەسیان بەکارێك ڕازی بون ویەکیان خۆی دورخستەوە، لەملی بدە وئەگەر چوار کەس ڕازی بون و دوان نە، ئەو دوانە بکوژە. ئەگەر سێ بە سێ بون، عەبدالله کوڕی عومەر بکەنە داوەر و ئەگەر بەداوەری عەبدالله کوڕی عومەر ڕازی نەبون، لەگەڵ ئەو کەسانەدابن کەعەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەگەڵیاندایە. ئەوسا ئەگەر ئەو سێ کەسە لەوەی خەڵك لەسەری ڕێککەوتن، خۆیان دورخستەوە، کوشتاریان بکەن.

ئەوان هاتنەدەر. عەلی بەدەستەیەك لەهاشمیەکانی فەرمو: ئەگەر خەڵکەکەی ئێوە لەناو ئێوەدا فەرمانیان بەسەردا بکرێت، هیچ کات بەفەرمانڕەوایی ناگەن. مامەکەی عەباس ڕوبەڕوی بویەوە. عەلی پێی وت: هەمو شتێك لەدەست ئێمە ڕۆشت. عەباس وتی: لەکوێوە دەزانیت؟ عەلی وتی: بەنی عوسمانیان هێنایە سەرکار (عەلی بەم شێوەیە درێژەی بەقسەکەیدا کەعومەر) وتی: شوێن زۆرینە بکەون. لەگەڵ ئەو کەسانەدا بن کەعەبدولرەحمان کوڕی عەوفیان لەگەڵدایە. ئاشکرایە سەعد کوڕی وەقاص لەگەڵ کوڕە مامەکەی خۆی ناسازگاری ناکات. عەبدولرەحمان کوڕی عەوفیش زاوای عوسمانە و ئاشکرایە ئەم دوانەیش ناسازگاری یەك ناکەن و بێ گومان یەکێك لەوان ئەویتریان هەڵدەبژێرێت. ئەگەر ئەو دوانەی دیکە لەگەڵ مندا بن، هیچ سودێکی بۆ من نیە.

عەباس بەعەلی وت: لەهیچ کارێکدا ڕێنوێنی تۆم نەکرد مەگەر ئەوەی درەنگتر هاتیت و دیاریەکەت هێنا کەلێی بێزار بوم. کاتێك پێغەمبەر(ص)ی خوا ویستی ماڵئاوایی لەجیهان بکات، پێم وتی تا لێی بپرسیت کێ دەبێتە خەلیفە. تۆ خۆت بەدور گرت.

دوای مردنی ئەو، داوام لێکردی بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت پەلە بکەیت و تۆ رازی نەبویت. دواتر کاتێك عومەر ناوی تۆی لەگەڵ ئەو شەش کەسەدا هێنا، پێم وتی بەشداری مەکە. دوبارە ئامۆژگاریەکانی منت بەکار نەبرد. ئێستا ئەم قسەیەم لەگوێ بگرە. هەر شتێك ئەمانە لەگەڵ تۆدا باسی بکەن، پشتی تێبکە و بلێ، نە مەگەر ئەوەی خەلافەت بەتۆ ببەخشن. لەمانە خۆت بەدور بگەر کەبەردەوام ئێمە لەم کارە دور دەخەنەوە تا کەسانیتر ڕشتەی کارەکان بگرنەدەست. سوێند بەخوا بەخراپە و زیان بەدەستی دێنن کەهیچ چاکەیەك سودی پێ نابەخشێت! عەلی وتی: ئاگادار بن ئەگەر عوسمان پایەدار بێت، بیریدەخەمەوە کەچی کردوە. ئەگەریش بمرێت، خەلافەت لەناو بنەماڵەکەی خۆیدا دەهێڵێتەوە تا دەست بەدەست بیگێڕن. ئەگەر ئەم کارە بکەن، لەپێگەیەکدا من دەبیین کەلەرز دایانبگرێت. دواتر ئەم قسانەی هێنایە سەرزمان:

حلفت برب الراقصات عشية غدون حفافا فابتدرن المحصبا

ليختلين رهط ابن يعمر قارنا نجيعا بنو الشداخ وردا مصلبا

یانی: سوێند بەخواوەندی کچانی سەماکەر لەو ئێوارێی کە نەرم وباڵ سوك بەرەو بەردەلان رایانکرد، بێ گومان دار و دەستەی کوڕی یەعمەر سەر لەجەستەی شەرکەرێکی شمشێر وەشێن و تیر هاوێژ دەستێنن ونەوانەی پشتیان کردە راستی و دروستی، رودەکەنە مێرگەلانێکی چڕ و ئەستێلکێکی ڕەق.

عەلی پشتی تێکرد وئەبو تەڵحەی بینی بەلام ڕێزی لێ نەگرت. ئەبو تەڵحە وتی: گەورەم، ئەی باوکی حەسەن، ئارام بە.

کاتێك عومەر مرد، جەستەکەیان هێنایەدەر و صوهەیب نوێژی لەسەر کرد. کاتێك عومەر بەخاك سپێردرا، مێقداد راوێژکەرانی لەماڵی میسودر کوڕی مەخرەمە یا لەگەنجخانە یا لەماڵی عایشە، کۆکردەوە و هێشتا تەڵحە نەگەیشتبو. فەرمانیان بەئەبو تەڵحەدا، ئەوان بگرێت و لەو ماڵەدا پاسەوانیان بکات. عەمرۆ کوڕی عاص و موغەیرە کوڕی شەعبە گەیشتن و لەبەر دەرگای ماڵەکە دانیشتن. سەعد ئەم دوانەی دور خستەوە و لەسەر جێگەی خۆی دانیشت و وتی: دەتانەوێت بلێن: ئێمە چوین و لەناو راوێژکاران راوێژمان کرد! لەم کاتەدا خەڵك بۆ بەدەست هێنانی فەرمانڕەوایی تێکەڵ یەك بون و وتارەکان لەناو ئەواندا زیادی کرد. ئەبو تەڵحە وتی: بەردەوام لەوە دەترسام

فەرمانڕەوایی لەخۆتان دور بکەنەوە و هەرکام بەوی تری بسپێرێت بەڵام بیرم لەوە نەدەکردەوە لەسەر فەرمانڕەوایی شەڕی یەکتر بکەن. سوێند بەو کەسەی گیانی عومەری گرت، زیاتر لەسێ رۆژ مۆڵەت بەئێوە نادەم چونکە عومەر دیاری کردوە. دواتر لەماڵەکەی خۆم دادەنیشم و دەڕوانم تا بزانم چیتان کردوە! عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی: کام یەك لەئێوە خۆی لەم کارە بەدور دەگرێت تا پیاوێکی شیاوتر کاروبارەکان بگرێتە دەست؟ کەس وەڵامی نەدایەوە. عەبدولرەحمان وتی: من خۆم دەکێشمەوە. عوسمان وتی: من باشتر لەهەموان لەم کارەی تۆ رازی دەبم! ئەو کەسانە وتیان: رازی بوین. عەلی بێدەنگ بو و هیچی نەوت. عەبدولرەحمان پرسی: ئەی باوکی حەسەن تۆ چی دەڵێیت؟ عەلی وتی: سوێند وپەیمانێکی بەهێز بەمن بدە کەبێ چەند و چون شوێن راستی و دروستی بکەویت و گوێ لەمەبەستەکانی جەستە نەگریت و خزمایەتی نەکەیتە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندن و خێرخوازی لەخەڵك درێغ نەکەیت. عەبدولرەحمان وتی: ئێوە پەیمان و سوێندێکی بەهێز بەمن بدەن کەهاورێ لەگەڵ من لەبەرابەر کەسێکدا بن، بگۆڕێت و کارێکیتر بکات. هەروەها پەیمان بدەن، بەهەرکەس پەسەندم کرد، رازی ببن. منیش سوێند دەخۆم و پەیمان دەدەم کەخزم لەبەر خزمایەتیەکەی هەڵنابژێرم و خێرخوازی و کار و شەڕ کردن لەرێگەی خوا لەموسوڵمانەکان ناشارمەوە. ئەو پەیمانی لەوان سەند و پەیمانی بەواندا. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بەعەلی کوڕی ئەبی تالبی وت: تۆ دەڵێی، من لەهەموی ئەم کەسانەی لێرەدا کۆبونەتەوە، بۆ ئەم کارە شیاوترم چونکە پەیوەندیەکی نزیکی خزمایەتیم لەگەڵ پێغەمبەر(ص)دا هەیە و لەپێشنەیەکەی درەخشانتر کەڵك وەردەگرم و نیشانەیەکی نەمرم لەدینی ئیسلام بەجێهێشتوە. تۆ درۆ ناکەیت بەڵام چی دەڵێیت ئەگەر ئەم کارە بەتۆ نەسپێرن و بیخەنە ئەستۆی یەکێکیتر. کام کەسە لەناو ئەم شەش کەسە بەشیاوتر دەزانی؟ عەلی وتی: عوسمان. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەگەڵ عوسمان دانیشت و وتی: تۆ دەڵێیت پیرە پیاوێکی لەعەبد مەناف و زاوای پێغەمبەر(ص)ی خوایت، کوڕە مامی پێغەمبەر(ص)یت و پێشینە و گەورەییت هەیە، چۆن ئەم کارە بەمن نەسپێرن؟ بەڵام ئەگەر تۆ هەڵنەبژێرن، کێ لەناو ئەم شەش کەسە بەشیاوتر دەزانیت؟ عوسمان وتی: عەلی.

عەلی، چاوی بەسەعد کوڕی وەقاص کەوت و پێی وت: لەخوا بترسن چونکە لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکات، ئاگادار بن خزمایەتی خۆتان بەفیرۆمەدەن (نسط ١/٤). تۆ بەخزمایەتی ئەم دوکوڕەم لەگەڵ پێغەمبەر(ص) سوێند دەدەم و هەروەها بەخزمایەتی حەمزەی مام کەهاورێ لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی عەوف پشیتوانی لەعوسمان نەکەیت. عەبدولرەحمان لەو شەوانەدا گەڕا و چاوی بەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) و فەرماندەکانی سوپا و گەورەکانی مەدینە کەوت و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد. کاتێك دوایین شەو گەیشت، ڕۆشتە ماڵی میسوەر کوڕی مەخرەمە، بەئاگای هێنایەوە و وتی: ئەمشەو نەمتوانی بخەوم، بڕۆ زوبەیر و سەعد بانگ بکە.ئەم دوانەی بانگ کرد. لەزوبەیرەوە دەستی پێکرد و وتی: ئەم کارە بەمناڵەکانی عەبد مەناف بسپێرە. زوبەیر وتی: من دەنگ بەعەلی دەدەم. بەسەعدی وت: دەنگی خۆت بەمن بدە. سەعد وتی: ئەگەر خۆت هەڵدەبژێریت، رازیم و ئەگەر عوسمان هەڵدەبژێریت، عەلی لای من شیاوترە. ئەی پیاو، لەگەڵ خۆت بەیعەت بکە و ئێمە ئاسودە و سەربڵند بکە. عەبدئەلرەحمان وتی: سوێندم خواردوە لەم کارە خۆم بەدور بگرم وئەگەر سوێندیشم نەخواردایە، ئەم کارەم لەئەستۆ نەدەگرت. من بێستانێکی سەرسەوز و شادم بینی و دواتر ئاژەڵێکی نێر و بەهێز کەلەو باشترم نەدیبو. ئەو وەك تیرێك لەسەرێکی بێستان هاتە ناو و لەو لای ڕۆشتەدەر. ئەو رێگای بڕی و سەیری هیچی نەکرد. دواتر وشترێکی نێر بەدوایدا هات و بەرێگەی ئەودا ڕۆشت و لەبێستانەکە ڕۆشتەدەر. دوای ئەو وشترێکی نێری بێ وێنە کەهەوسارەگەی خۆی رادەکێشا و رێگەی ئەو دوانەی دەبڕی (پێغەمبەر(ص) و ئەبوبەکر و عومەر بەشێوەیەك هاتنە ئەم دنیا و ڕۆشتن کەهیچ کەلکێکیان لێ وەرنەگرت). دواتر چوارەمین وشتر هات و لەوێ دەستی بەلەوەڕین کرد. سوێند بەخوا من چوارەم کەس نابم. دوای ئەبوبەکر و عومەر کەسێك نایێتە سەر کار کەخەڵك لێی رازی بن.

دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی عەوف، میسوەر کوڕی مەخرەمی بەدوای عەلیدا رەوانە کرد و ماوەیەکی درێژ لەگەڵ ئەو گفتوگۆی کرد و عەلی بێ چەند و چون گومانی دەکرد فەرمانڕەوایی بەو دەگات. دواتر ناردی بەدوای عوسماندا و ئەم دوانە تا بەیانی بەگوێی یەکدا چرپاندیان تا ئەوەی بەرەبەیان جیایی لەناو ئەواندا دروست کرد.

عەمرۆ کوڕی مەیمون دەڵێت: عەبداللە کوڕی عومەر بەمنی وت: ئەگەر کەسێك بەتۆ بڵێت کەدەزانێت عەبدولرەحمان چی بەعەلی و عوسمان وتوە، لەڕوی نەزانیەوە قسەی کردوە. چارەنوسی خوا بەو شێوەبو ئەم کارە بەعوسمان بسپێردرێت. کاتێك خەڵك نوێژی بەیانیان خوێند، عەبدولرەحمان ئەو شەش کەسەی کۆکردەوە و کەسی بەدوای ئامادەبوان لەئەنسار و موهاجیرەکان و گەورەکان لەهەردولا و فەرماندەی سوپاکان نارد و ئەوان هاتن و لەمزگەوت کۆبونەوە بەشێوەیەك مزگەوت لەوان پڕبو. عەبدولرەحمان هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، خەڵکان ڕێککەوتن تا شاریەکان بۆ شارەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. بۆچونی راست بەمن بڵێن تاج کەسێك هەڵبژێرم. عەمار وتی: ئەگەر دەتەوێت ئاژاوە لەناو موسوڵمانان دروست نەبێت، عەلی هەڵبژێرە. میقداد کوڕی ئەسوەد وتی: عەمار راست دەکات، ئەگەر بەیعەت لەگەڵ عەلی بکەیت، دەیبیستین و فەرمانبرداری دەکەین. کوڕی ئەبی سەرح وتی: ئەگەر دەتەوێت ئاژاوە لەناو قورەیشیەکان دروست نەبێت، لەگەڵ عوسمان بەیعەت بکە. عەبداللە کوڕی ئەبی رەبیعە وتی: ئەگەر لەگەڵ عوسمان بەیعەت بکەیت، دەیبیستین و فەرمان دەبەین. عەمار جوێنی بەکوڕی ئەبی سەرەحدا و وتی: تۆ لەکەیەوە چاکەی موسوڵمانانت دەوێت؟ بەنی هاشم و بەنی ئومەییە دەستیان بەگفتوگۆ کرد. عەمار وتی: ئەی خەڵکینە، خوا ئێمەی بەپێغەمبەر(ص)ەکەی ڕێزدار کرد و بەئاینەکەی سەری بەرز کردین. ئەم کارە چۆن لەبنەماڵەی پێغەمبەر(ص) دەستێنن وبۆ کوێی دەبەن؟ پیاوێك لەبەنی مەحزم وتی: ئەو کوڕی سومەیە، سنوری خۆت دەبەزێنیت؟ بەتۆچی کەقورەیشیەکان دەیانەوێت کێ بکەنە فەرمانڕەوایی خۆیان! سەعد کوڕی ئەبی وەقاص وتی: ئەی عەبدولرەحمان پێش ئەوەی ئاژاوە لەناو خەڵکدا دروست ببێت، کۆتایی بەم کارە بێنە. عەبدولرەحمان وتی: من بەباشی هەڵسەنگاندنم بۆ ئەم کارە کرد و لەگەڵ فرەزانەکان راوێژم کرد. بەشەش کەسەکەی وت ڕێگەیەك بۆ خۆتان مەهێڵنەوە. عەلی بانگ کرد وپێی وت: سوێند و پەیمانی خوا لەئەستۆی تۆ بێت کەبێ چەند و چون نوسراوی خوا و شێوەی کرداری پێغەمبەر(ص) بەکار ببەیت و بەڕێگەی دوجێگرەکەیدا بڕۆیت. عەلی وتی: هیوادارم ئەم کارە بکەم و بەئەندازەی زانست و توانایی خۆم کارەکان ئەنجام بدەم( عەلی ڕێگەی دو جێگرەکەی یانی ئەبوبەکر و عومەری لەوتەکانی

خۆیدا پشت گوێ خست). دواتر عوسمانی بانگ کرد وئەوەی بەعەلی وت، بەویشی وت. عوسمان وتی: ئەو کارە دەکەم. لەم کاتەدا عەبدولرەحمان سەری بەرز کردەوە و دەستی عوسمانی خستە ناو دەستی و وتی: ئەی خوایە ببیستەو شایەت بە. ئەی خوایە، ئەوەی لەئەستۆی مندابو، خستمە ئەستۆی عوسمان. دواتر لەگەڵ ئەو بەیعەتی کرد.

عەلی وتی: ئەمە یەکەم جار نەبو ستەمتان لەئێمەکرد (( کەواتە خۆڕاگری شیاو دەبێت و تەنیا خوایە دەبێت داوای هاوکاری لێ بکرێت چونکە ئێوە لەکارەکاندا فێڵ و فریوتان دەکرد. یوسف/١٨/١٢)). سوێند بەخوا تەنیا لەبەر ئەوە عوسمانت هێنایە سەر کار تا دوای خۆی تۆ بێنێتە سەر کار، بەڵام فەرمانەکانی خوا لەرۆژدا دەگۆڕێن. عەبدولرەحمان وتی: ئەی عەلی، رێگەی رەخنە گرتن بەخۆت مەدە. عەلی هاتەدەر و بەردەوام دەیوت: بەزویی نوسراو بەکۆتایی خۆی دەکات. میقداد وتی: ئەی عەبدولرەحمان، سوێند بەخوا لەعەلی خۆش بویت وئەوت پشت گوێ خست و دەزانی لەو کەسانەیە لەسەر بنەمای راستی و دروستی کارەکانی ئەنجام دەدات و تەنیا ئەو دەکەن بەداوەری خۆیان. عەبدولرەحمان وتی: ئەی میقداد، سوێند بەخوا هەوڵم بۆ موسوڵمانانندا. میقداد وتی: ئەگەر بەدوای رەزامەندی خواوە بویت، خوا پاداشت بداتەوە. دوبارە میقداد وتی: نەمبینیوە دوای پێغەمبەر(ص) لەگەڵ بنەماڵەکەی بەمشێوەیە هەڵس و کەوت بکەن. سەرم لەقورەیشیەکان سوڕدەمێنێت. ئەوان پیاوێکیان پشت گوێ خست کەناڵێم و نازانم پیاوێك لەو دادپەروەرتر و ئاشناتر بەداد وراستی و دروستی بێت. سوێند بەخوا ئەگەر لەبەرژەوەندی ئەو هاورێم دەبوا.... عەبدولرەحمان وتی: ئەی میقداد لەخوا بترسە چونکە لەوە دەترسم ئاژاوە دروست بکەیت. پیاوێك بەمیقدادی وتی: خوا لێت خۆش بێت ((بنەماڵەی پێغەمبەر(ص) کێن)) و ئەم پیاوە کێیە؟ میقداد وتی: بنەماڵەی پێغەمبەر(ص)، مناڵەکانی عەبدولموتەلیبن و ئەم پیاوە عەلی کوڕی ئەبی تالبە. عەلی وتی: خەڵك سەیری قورەیشیەکان دەکەن و قورەیشیەکان نیگەرانن و دەڵێن: ئەگەر بەنی هاشم ببنە فەرمانڕەوایی ئێوە، هیچ کات فەرمانڕەوایی لەدەستی ئەوان دەرناچێت وئەگەر لەناو کەسانیتردا بێت، ئێوە دەتوانن لەناو خۆتاندا ناڵ و گۆڕی پێبکەن.

تەڵحە لەو رۆژەدا گەیشت کەخەڵك لەگەڵ عوسمان بەیعەتیان کرد. پێیان وت: خەڵك

لەگەڵ عوسمان بەیعەتیان کرد. تەڵحە وتی: هەمو قورەیشیەکان بەوە رازین؟ وتیان: بەڵێ. تەڵحە هاتە لای عوسمان و عوسمان پێی وت: تۆ لەسەر کاریت و ئەگەر بەفەرمانڕەوایی من رازی نەبیت، لەکارەکەت دورت دەخەمەوە. وتی: ئایا دورم دەخەیتەوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئایا هەمو خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ تۆدا کرد؟ وتی: بەڵێ. تەڵحە وتی: منیش پێی رازیم و ئەوەی خەڵك لەسەری رێککەوتون و لەو کەسەی بەیعەتیان لەگەڵ بەستوە، خۆم دور ناخەمەوە. تەڵحە لەگەڵ عوسمان بەیعەتی کرد.

موغەیرە کوڕی شەعبە بەعەبدولرەحمانی وت: کارێکی راستت کرد کەعوسمانت هەڵبژارد. موغەیرە بەعوسمانی وت: ئەگەر عەبدولرەحمان لەگەڵ کەسێکیتر جگە لەتۆ بەیعەتی دەکرد، ئێمە رازی نەدەبوین. عەبدولرەحمان وتی: ئەی پیاوی یەك چاو، درۆ دەکەیت. ئەگەر بەیعەتم لەگەڵ کەسێکیتر دەکرد، تۆیش بەیعەتت لەگەڵ دەکرد و ئەم قسانەت دەهێنایە سەرزمان. میسوەر کوڕی مەخرەمە بەردەوام دەیوت: هەرگیز نەمبینیوە کەسێك بەسەر خەڵکانێك کەبۆ کارێك رێککەوتون، زاڵ ببێت بەهەمان شێوە کەعەبدولرەحمان کوڕی عەوف زاڵبو.

من دەڵێم: ئەوەی کەعەلی فەرموی: عەبدولرەحمان زاوای عوسمانە، لەبەر ئەوەبو کەعەبدولرەحمان لەگەڵ دایکی کولسوم کوڕی عوقەبە کوڕی ئەبی موعیت (خوشکی عوسمان) پەیوەندی هاوسەریەتی بەست کەعوقەبە دوای عوسمان بوبەسەرپەرەستی ئەم ژنە.

ئەبو جەعفەری تەبەری ئاماژەی بەگێڕانەوەیەکی دیکە سەبارەت بەراوێژ کردن لەزمانی میسوەر کوڕی مەخرەمە داوە کە لەخۆگری گێرانەوەی کوژرانی عومەرە و ئێمە ئاماژەمان پێدا. ئەوەی لێرەدا باسی کردوە، نزیکە لەوەی ئاماژەی پێدرا. جگە لەوەی کەدەڵێت: کاتێك عومەر بەخاك سپێردرا، عەبدولرەحمان ئەوانی کۆکردەوە و قسەی بۆ کردن و فەرموی کۆببنەوە و خۆیان لەبلاوە لێکردن بەدور بگرن. عوسمان کوڕی عەفان هاتە قسە و وتی: سوپاس بۆ خوا کەمحەممەدی وەك پێغەمبەر(ص) هەڵبژارد و ئەوەی وەك نێردراو رەوانە کرد و مزگێنیەکانی خۆی هێنایە دی و بەخشینەکانی خۆی پێبەخشی وبەسەر هەمواندا زاڵی کرد چ ئەوانەی لەروانگەی نەژاد و بنەماڵە لەو دور بون وچ ئەوانەی وەك خزمی ئەو هەژمار دەکران. سلاوی خوای لێ

بێت. خوا ئێمە بکاتە شوێنکەوتوی ڕێگەکەی. ئەو بۆ ئێمە روناکی بو وئێمە بەفەرمانی ئەوە لەکاتی بەربلآوی خواستەکانی هاورێیان و گرفتاری دوژمنان کۆدەبینەوە. خوا بەپیرۆزی ئەو فەرمانڕەوایی بەئێمە بەخشی. فەرمانڕەوایی لەدەستی ئێمە دەرناچێت وکەسی تر ئەم کارە ناگرێتە دەست مەگەر ئەوەی پشت بکاتە راستی و دروستی و بەلارێدا بڕوات. ئەی کوڕی عەوف، ئەگەر تۆ پشتگوێ بخەن یا لەگەڵ تۆ ناسازگاری بگرنە بەر و وەڵامی بانگێشتەکەی تۆ نەدەنەوە، شیاوترین و شایانترین کەس بۆ ئەم کارەیت و من یەکەم کەس دەبم وەڵامی بانگێشتەکەی تۆ دەدەمەوە و لەسەر ئەوەی دەیڵێم پەیمان دەدەم و لەسەر پەیمانەکەی خۆم دەمێنمەوە.

دواتر زوبەیر کوڕی عەوام هاتە قسە و وتی: ئەو کەسەی بۆ لای خوا بانگێشتمان دەکات، بەنەناسزاوی نامێنێتەوە و وەڵامدەرەوە بەبانگێشتی خوا بێ یار و هاورێ ناژیت و ئەمە لەکاتێکدایە مەبەست و خواستەکان بلآوببنەوە و گەردنەکان بەم لاولادا بسوڕێن. لەوەی وتت، جگە لەگومڕا، کەمتەرخەمی ناکات وئەوەی بانگەشەی دەکەیت، جگە لەبەدبەخت پشتگوێی ناخات. ئەگەر ئەوە نەدەبو کە لەدینی خوابۆ تاوان و گوناحەکان سزا دیاری کراوە و بۆ پەرستینی خوا، فەرمان و کارە پێویستەکان دیاری کراوە و لەئەستۆی باوەڕداراندایە و بەردەوام زیندوی نەمرە، مردن رێگەی رزگاری لەفەرمانڕەوایی بو و هەڵاتن لەبەڕێوبردنی وڵات و دەبود قەڵایەك بۆ دوربون لەگوناحکاری و هەڵە. بەڵام خوا لەسەر ئێمە پێویستی کردوە، وەڵامی بانگێشتەکەی بدەینەوە و شێوەی کرداری پێغەمبەر(ص)دکەی ئاشکرا بکەین تا گیرۆدەی مەرگێکی کوێرانە نەبین و لەنەزانی رۆژگار نەمێنینەوە. من بەتۆ رازیم لەوەی باست کرد و هاورێی تۆم لەوەی فەرمانی ئەنجامدانی دەدەیت. هەمو هێز و تواناییەکان تەنیا هی خوایە. من لەخوا بۆ ئێوە و خۆم داوای لێخۆش بون دەکەم.

دواتر سەعد کوڕی وەقاص هاتە قسە و دوای وەسف کردنی خوا، وتی: لەگەڵ محەممەد دابو، رێگاکان روناك دەبونەوە و رێگاکان بەهێز، لەگەڵ ئەودا بو راستی و دروستی لەهەر شتێکدا دەرکەوت و خواری نەما. ئەی ئەو دەستەی لێرەدا کۆبونەتەوە، لەوتەی ناڕاست خۆتان بەدور بگرن و ئارمانی خۆ فریودەرەکان پشت گوێ بخەن. پێش ئێوە ئارمانەکان زۆر لەخەڵکانیان لەمەبەستەکانیان دور خستۆتەوە و هەمو شتێکی لەدەستی

ئەوان فڕاندوە. ئەوان، ئەو شتەیان بەمیرات بردوە، کەئێوە بردوتانە و بەوە گەیشتون، کەئێوە پێی گەیشتون. خوا ئەوانی بەدوژمنی خۆی لەقەڵەمدا و نفرینێکی گەورەی بەسەردا باراندن. خوای گەورە دەفەرمێت: نفرین کران ناباوەڕانی بەنی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسا کوڕی مریەم، ئەمە سزایەکە بۆ ئەوان چونکە گوناحکاریان کردە پیشە و لە زوڵم کردن لەکەسانیتر سنورەکانیان بەزاند. ئەوان یەکتریان لەو کارە قێزەونانەی کەدەیانکرد، دور نەدەخستەوە. کارێکی شیاوی سەرکۆنە کردنیان دەکرد (مائدە٥/٧٨—٧٩). من هەمو تیرەکانی تیردانەکەی خۆم هاویشت و تیرە گیان ستێنەکانم هەڵگرت و ئامانجەکەم کردە نیشانە. بۆ تەڵحە کوڕی عوبەیداللە ئەوەم هەڵبژارد کەخۆم پەسندم کرد. من پەیمان دەدەم و وەڵامدانەوەی ئەوەی لەلایەن ئەو، ئەنجامی دەدەم، لەئەستۆ دەگرم. ئەی کوڕی عەوف، ئەم کارە لەدەستی تۆدایە کەبەرنج بردن و بڕینی ڕێگەی ڕاست کۆتایی بەمە کارە بێنیت وبزانیت کەکردنەوە و روناك کردنەوە و ڕێنوێنی کران لەرێگاکان لەدەستی خوادایە و گەڕانەوەی هەموان بۆ لای ئەوە. لەخوا بۆ خۆم و ئێوە داوای لێخۆشبون دەکەم و پەنا بەخوا دەبەم تا لەگەڵ ئێوەدا ناسازگار نەبم.

دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالب زمانی بۆ قسە کردن کردەوە و وتی: سوپاس بۆ خوا کەمحەممەدی لەناو ئێمەدا وەك پێغەمبەر(ص) هەڵبژارد و ئەوی وەك نێردراوێك بۆ لای ئێمە ڕەوانە کرد. ئێمە بنەماڵەی پێغەمبەر(ص)ین و کانگای فرمزانی و هۆکارەکانی ئاسودەیی خەڵك و پەناگایەك بۆ رزگار بون. هەرکەس بەدوای رزگاریدا بگەرێت، رو لەئێمەدەکات. ئێمە مافێکمان هەیە کەئەگەر بەئێمەی بدەن، وەریدەگرین و ئەگەر نەیدەن، دەپەڕینە پشت چوارپێیەکی تیژپێ و بەدوایدا دەگەڕێین هەرچەندە لەو ڕێگادا شەوڕەوی درێژە بکێشێت. ئەگەر پێغەمبەر(ص)ی خوا لەبەرژەوەندی ئێمە پێشنیارێکی دەکرد، بەکارمان دەبەست و ئەگەر فەرمانێکی بەئێمەدەدا، لەسەر ئەنجامدانی شەڕمان دەکرد تا لەو ڕێگا گیان بسپێرین. هیچ کەس پێش من بۆ وەڵامدانەوەی بانگێشتی ڕاستی و دروستی و بەهێز کردنی ڕشتەی خزمایەتی، هەنگاو نانێتە پێش. هیچ هێز و توانایيەك جگە لەهێز و توونایی خوا نیە. قسەکانی من ببیستن و وتارەکانم لەگوێ بگرن. بەزویی دەبینن لەرێگەی ئەم کارەدا، بەدەست هێنانی

فەرمانڕەوایی، شمشێرەکان لەکالآن دەردەکێشرێن و پەیمانەکان دەشکێن تا سەرئەنجام ئێوە ببنە دەستەیەکی گوناحکار و دەستەیەك لەئێوە ببنە پێشەواکانی گومڕایی و شوێنەکەوتوانی شێوازی نەزانی. دواتر وتی:

فان تك جاسم هلكت فانی — بما فعلت بنو عبد بن ضحم

مطیع فی الهواجر كل غیء — بصیر بالنوی من كل نجم

یانی: ئەگەر هۆزی جاسم بەرەو لەناوچون بڕوات، من بەدوای ئەو کارانەی بەنی عەبد کوڕی زەخم کردیان، لەژێر هەتاوی سوتێنەر لەگەرمەی رۆژ، بەدوای هەر نیشانەیەك ڕێگە دەبڕم و بەدوای هێڵەکانی باران لەهەر ئەستێرەیەکدا دەگەڕێم.

لەم کاتەدا عەبدولرەحمان وتی: کام یەك لەئێوە بەگیان ودڵ رازی دەبن و لەم کارە دەڕۆنەدەر و خۆتان دەکێشنەوە.

ئەبو جەعفەری تەبەری بەمشێوەیە درێژە بەگێڕانەوەکەی خۆی دەدات کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

## هاتنە سەر کاری عوسمان

دواتر عوسمان دوای بەیعەت بەستنی خەڵك لەگەڵ ئەو، لەمزگەوت دانیشت و عوبەیداللە کوڕی عومەری خەتابی بانگ کرد. ئەم پیاوە، بکوژەکەی باوکی ئەبولۆلۆ و پیاوێکی مەسیحی بەناوی جۆفەینە لەخەڵکی حیرە لەپشتیوانانی سەعد کوڕی مالك و هورموزانی کوشتبو. کاتێك دەیویست بەشمشێر هورموزان بکوژێت، هورموزان هاواری کرد: پەنا بەخوا! خوایەك جگە لەپەروەردگار نیە! کاتێك ئەم سیانەی کوشت، سەعد کوڕی وەقاص ئەوی گرت و لەماڵەکەی خۆی زیندانی کرد. شمشێرەکەی لێسەند و بردیە لای عوسمان. عوبەیداللە بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا ئەو پیاوانەی لەکوشتنی باوکم شەریك بون، کوشتار دەکەم. بەم کارە تانەی لەموهاجیرەکان و ئەنسار دەدا. ئەم سیانەی لەبەر ئەوە کوشت چونکە عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر لەرۆژی کوژرانی عومەر وتبوی: دوێ شەو هورموزان و جۆفەینە وئەبولۆلۆم بینی کەئارام و بەهێواشی لەگەڵ یەك قسەیان دەکرد و کاتێك منیان بینی، بلآوەیان لێکرد و کێردێکی دوسەر لەناویان کەوتەخوار کەدەسکەکەی لەناوەڕاستەکەیدابو. ئەوە هەمان کێردبو کەعومەری

پێ کوژرا. لەبەر ئەمە عوبەیدالله ئەوانی کوشت. کاتێك ئەویان هێنا، عوسمان وتی: سەبارەت بەم پیاوە رێنوێنیم بکەن چونکە ئەو کەلێنەی دەیبینن، لەئیسلامدا دروستی کرد. عەلی وتی: بۆچونی من ئەوەیە بیکوژیت. یەکێك لەموهاجیرەکان وتی: دوێنێ عومەر کوژرا و ئەمرۆ کورەکەی بکوژرێت! عەمرۆ کوڕی عاص وتی: خوا تۆی لەوە بەخشیوە کە ئەم پێشهاتە لەناو موسوڵمانانەدا روبدات و تۆ فەرمانڕەوایی ئەوان بیت. عوسمان وتی: من سەرپەرەستی خوێنی موسوڵمانانم و لەبەر ئەمە خوێنبایی بۆ دیاری دەکەم و لەسامانی خۆم دەیدەم. زیاد کوڕی لەبیدی ئەنساری، هەر کات عوبەیداللەی دەبینی، دەیوت:

| | |
|---|---|
| الا یا عبیدالله مالك مهرب | ولا ملجا من ابن اروی و لا خفر |
| اصبت دما و الله فی غیر حله | حراما و قتل الهرمزان له خطر |
| علی غیر شیء غیر ان قال قائل | انتهمون الهرمزان علی عمر |
| فقال سفیه و الحوادث جمه: | نعم اتهمه قد اشار و قد امر |
| و کان سلاح العبد فی جوف بیته | یقلبها و الامر بالامر یعتبر |

یانی:

ئەی عوبەیدالله ، تۆ لەکوڕی ئەروی نەرێگەی هەڵاتنت هەیە، نەپەناگا، نەسەنگەر و نەپشتیوان. سوێند بەخوا دەستی بەخوێنێك پیس کرد کەڕژاندنەکەی ڕەوا نەبو. بەناڕەوا ئەم کارەت کرد و ڕشتنی خوێنی هورموزان گران بو. بێ هیچ بەڵگەیەك جگە لەوەی بێژەرێك وتی: ئایا هورموزان لەرشتنی خوێنی عومەر بەشەریك دەزانن؟ نەزانێك وتی: ( و رووداوەکان کەڵەکەبون): بەڵێ. ئەو بارودۆخەکەی ئامادە کرد و فەرمانی کوشتنەکەی دەرکرد. کەل و پەلی شەڕی ئەوو کۆیلە لەماڵەکەیدا بو کەژێر و روی دەکرد. کارەکان بەکارەکان هەڵدەسەنگێنن.

عوبەیدالله لەدەستی زیاد گلەیی بردە لای عوسمان و عوسمان رێگەی ئەم کارەی لەزیاد گرت. زیاد سەبارەت بەعوسمان وتی:

| | |
|---|---|
| ابا عمرو عبیدالله رهن | فلا تشکك بقتل الهرمزان |
| فانك ان غفرت الجرم عنه | و اسباب الخطا فرسا رهان |
| اتعفو اذ عفوت بغیر حق | فمالك بالذی تحکی یدان |

یانی:

ئەی ئەبو عومەر، بزانە و گومانت لەم کاردا نەبێت کەعوبەیدالله لەگرێوی خوێنی هورموزاندایە. تۆ ئەگەر لەو خۆشبیت دەبێت بزانیت کەئەو بەرشتەکانی گوناح، هاوشێوەی دو ئەسپن کە بەپەلە و لەپاڵ یەك غاردەدەن و پەیوەستی یەك بن. ئایا بەئاسانی گوناحی مرۆڤ کوشتن دەبەخشی؟ کەواتە تۆ لەوەی دەیکەیت و دەیڵێیت، دەستت کراوە نیە.

عوسمان زیادی بانگ کرد، ئەوی گرت ولەخۆی دور خستەوە.

سەبارەت بەپێدانی خوێنبایی بۆ تاوانەکەی عوبەیدالله، ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. غەمادیان کوڕی هورموزان وتی: ئێرانیەکان لەمەدینە هاتوچۆی یەکیان دەکرد (لەناو ئەوان فیروزان و هورموزان). رۆژێك فیرروز (ئەبولۆلۆ) لای هورموزانەوە تێپەڕی و کێردێکی دوسەری لەدەستا بو. هورموزان کێردەکەی لێسەند و وتی: بەمە چی دەکەیت؟ (بۆ کێردت هەلگرتوە؟) وتی: دەمەوێت تەختەی پێ داتاشم (یا تیر دروست بکەم). لەم کاتەدا پیاوێك ئەو دوانەی بینی. کاتێك عومەر کوژرا، ئەو پیاوە وتی: بینیم هورموزان کێردەکەی بەفیروزدا. عوبەیدالله پەلەی کرد و هورموزانی کوشت. کاتێك عوسمان هاتەسەر کار، دەستی منی بۆ سەر عوبەیدالله کردەوە. ئەوم هێنایە دەر و لەسەر زەوی کەسم نەبینی مەگەر ئەوەی لەگەڵ من بون و داوایان لەمن دەکرد خۆم ئەو کارە ئەنجام بدەم. بەوانم وت: ئایا دەمپارێزن؟ وتیان: نە. تەنیا جوێنیان پێدا. عوبەیداللەم بەخوا و خۆی سپارد. منیان سواری ماینێك کرد. سوێند بەخوا نەرۆشتمە هیچ دێ و شارێك جگە لەوەی چاوم بەهەمو خەڵکەکەی کەوت.

گێڕانەوەی یەکەم سەبارەت بەئازاد کردنی عوبەیدالله راسترە چونکە کاتێك عەلی هاتەسەر کار، بڕیاریدا عوبەیدالله بکوژێت. عوبەیدالله هەڵات و روی کردە شام و پەیوەستی معاویە بو. ئەگەر ئازاد کردنی ئەو بەفەرمانی خاوەن خوێنەکەدەبو، عەلی ئاهەنگی کوشتنی ئەوی نەدەکرد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

کارگوزاران لەم ساڵانەدا ئەمانە بون: لەمەککە نافع کوڕی عەبدولحەرەسی خوزاعی، لەتایف، سەفیان کوڕی عەبداللەی سەقەفی، لەصەنعا یەعلی کوڕی مونیە، لەکوفە موغەیرە کوڕی شەعبە، لەبەصرە ئەبوموسای ئەشعەری، لەمیسر، عەمرۆ کوڕی عاص، لەحمص، عومەیر کوڕی سەعد، لەدەمشق معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و لەبەحرەین و شارەکانی دەوروبەری عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاصی سەقەفی.

لەم ساڵەدا معاویە ڕۆشتە شەڕی (صایفە). ئەو کەسانەی هاوڕێیەتیان دەکرد: عوبادە کوڕی صامت، ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، ئەبوزەری غەفاری و شەداد کوڕی ئەوس بون.

لەم ساڵەدا معاویە لەسەر بنەمای ئاشتی دەستی بەسەر عەسقەلاندا گرت.

دامەزراوەی دادی کوفە لەدەستی شەریح دابو و دامەزراوەی دادی بەسرە لەدەستی کەعب کوڕی سور. دەستەیەك دەڵێن: ئەبوبەکر و عومەر داواکاری گشتیان دیاری نەکردبو.

هەروەها لەم ساڵەدا قتادە کوڕی نەعمانی ئەنساری کۆچی دوایی کرد. قتادە ئەو کەسەیە پێغەمبەر(ص) چاوەکانی باش کردەوە و بینایی بۆ گەڕاندەوە. عومەر کوڕی خەتاب نوێژی لەسەر خوێند. ئەو لەبەدریەکان بو. دەستەیەك دەڵێن لەساڵی ٦٤٥/٢٤ زاییندا مرد.

ئەم کەسانە لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر کۆچی دواییان کرد: حوباب کوڕی مونزەر کوڕی جەموحی ئەنساری لەبەدریەکان، رەبیعە کوڕی حەرەس کوڕی عەبدولموتەلیب کە بەتەمەنتر لەعەباس بو. عومەیر کوڕی عەوف کۆیلەی سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەبەدریەکان، عومەیر کوڕی وەهب کوڕی خەلەفی جومەحی لەشەڕکەرانی ئوحود، عودەی کوڕی ئەبی ئەلزەغبا جەهنی لەهەواڵنێرانی پێغەمبەر(ص)ی خوا لەرۆژی شەڕی بەدر کەبەشداری شەڕەکانی دیکەی کرد.

لەم ساڵەدا عومیم کوڕی ساعدەی ئەنساری مرد کە لەئامادەبوان لەبەیعەتی عەقەبە بو و لەشەڕکەرانی ئوحود. ئەو لە (بلی) بو و هاوپەیمانی ئەنسار هەژمار دەکرا.

هەروەها: سۆهەیل کوڕی رافعی ئەنساری لەبەدریەکان و مەسعود کوڕی ئەوس کوڕی زەیدی ئەنساری کۆچی دواییان کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە بو کەمەسعود زیندو

مایەوە و لەگەڵ عەلی بەشداری شەڕی صەفینی کرد.

لەم ساڵەدا واقد کوڕی عەبداللەی تەمیمی، هاوپەیمانی خەتاب مرد. ئەو یەکەم کەس بو لەئیسلامدا لەرێگەی خوا شەڕی کرد و عەمرۆ کوڕی حەزرەمی کوشت. باوەڕهێنانی ئەو پێش ڕۆشتنی پێغەمبەر(ص) بۆ ماڵی ئەرقەم بو.

لەم ساڵەدا ئەبو جەندەل کوڕی سوهەیل کوڕی عەمرۆ و براکەی عەبداللە کۆچی دواییان کرد. عەبداللە لەبەدریەکان بو بەڵام ئەبوجەندەل لەبەدر ئامادە نەبو چونکە باوکی ئەوی لەمەککە زیندانی کرد و تا ڕۆژی ئاشتی حودەیبیە رێگەی کۆچ کردن بۆ مەدینەی لێ گرت. پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەو چۆن رزگاری بو. لەم ساڵەدا ئەبو خالدی حەرەس کوڕی قەیس کوڕی خالد مرد. ئەو لەشەڕی یەمامە بریندار ببو. برینەکەی باش بویەوە بەڵام دوبارە چڵکی کردەوە و کوشتی. ئەو لەئامادەبوانی بەیعەتی عەقەبە و لەشەرکەرانی بەدر بو.

لەم ساڵەدا ئەبو خەراشی هەزلی وتاردەر مرد. هەواڵی مردنەکەی هەموان دەیزانن.

هەروەها لەم ساڵەدا غەیلان کوڕی سەلەی سەقەفی مرد. کاتێك ئیسلامی هێنا، دەژنی بو.

لەکۆتایی ئەم ساڵەدا صەعب کوڕی جوسامە کوڕی قەیسی لەیسی مرد.

## روداوەکانی ساڵی بیست و چوارەمی کۆچی (٦٤٥ زایینی)

### بەیعەت لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بۆ خەلافەت

لەرۆژی سێیەمی محەڕەمی ئەم ساڵە/٩ نۆڤەمبەر ٦٤٤ زاینی وەك رێبەری موسوڵمانان لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەتیان بەست. بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا، گێڕانەوەکان لەمبارەوە زۆرەن. ئەم ساڵەیان بە((ساڵی خوێن پژان لەلوت)) ناو بردوە چونکە ئەم نەخۆشیە لەناو زۆرینەی خەڵکدا بلاَو ببویەوە. راوێژکاران دەوری عوسمانیان گرت و کاتی نوێژی ئێواریْ گەیشت. بانگدەرەکەی صۆهەیب بانگیدا و خەڵك بۆ نوێژ کۆبونەوە. عوسمان هاتەدەر و لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند و بەخششەکانی ئەوانی سەد سەد زیاد کرد. خەڵکی شارەکانی بەشێوەی دەستەدەستە ردوانە کرد. یەکەم کەس بو ئەم کارەی کردە پیشە. ئاهەنگی تەختی وتاردانی کرد و لەهەمو خەڵکان خەمبارتر و پەرێشانتر بو. بۆ خەڵك قسەی کرد و ئامۆژگاری کردن و خەڵك رویان تێکرد و بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

### لابردنی موغەیرە لەکوفە و دانانی سەعد کوڕی وەقاص

لەم ساڵەدا لەسەر پێشنیاری عومەر موغەیرە کوڕی شەعبە لەفەرمانداری کوفە لابرا و سەعد کوڕی وەقاص وەك فەرمانداری ئەم شارە دەستنیشان کرا. عومەر پێش مردنی خۆی وتبوی: پێشنیار بەجێگرەکەی دوای خۆم دەکەم سەعد وەك فەرماندە دەست نیشان بکات چونکە لەسەر خیانەت و خراپەکاری ئەوم لەسەر کار لانەبرد. سەعد یەکەم فەرماندار بو عوسمان رەوانەی کرد. سەعد یەك ساڵ و ماوەیەك وەك فەرماندار مایەوە. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو عوسمان هەمو کەس لەکارگوزارەکانی نەگۆڕی چونکە عومەر بەمشێوەیە پێشنیاری کردبو. دواتر لەکۆتایی ساڵی یەکەم موغەیرەی لەسەر کار لابرد و سەعدی کردە جێنشینی. لەسەر ئەم بنەمایە فەرمانداری سەعد لەساڵی ٦٤٦/٢٥ زاییبی دەست پێدەکات.

## بەشێك لەروداوكان

لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی كرد. دەستەیەك دەڵێن: عەبدوارەحمان كوڕی عەوف بەفەرمانی عوسمان رێبەری حاجیەكانی گرتە دەست.

پێشتر ئاماژەی پێدرا كەزۆربەی دەست بەسەردا گرتنی شار و ولاتەكان بەوتەی هەندێ لەمێژوونوسان لەسەردەمی عوسمان ئەنجامدرا. ئاماژەمان بەناسازگاری گێڕانەوەكانی ئەواندا.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان كوڕی كەعبی ئەنساری ماڵئاوایی لەژیان كرد. ئەو لەبەدریەكان بو. ئەو یەكێك لە((شین گێرەكان)) لەشەڕی تەبوك بو (كە لەدوای شەڕ كشانەوە و ئەوەندە گریان تا خواوەند لەگوناحەكانیان خۆش بو).

هەروەها لەم ساڵەدا سوراقە كوڕی مالك كوڕی جەعشەمی مودلیجی كۆچی دوایی كرد. دەستەیەك دەڵێن: دوای ئەمە ماڵئاوایی لەژیان كرد. ئەو بو دوای كۆچ كردنی پێغەمبەر(ص) خۆی پێگەیاند (تادەستگیری بكات و تەسلیمی قورەیشیەكانی بكات).

## روداوەکانی ساڵی بیست و پێنجەمی کۆچی (٦٤٦زایینی)

## ناسازگاری خەڵکانی ئەسکەندەریە

لەم ساڵەدا خەڵکانی ئەسکەندەریە ناسازگاریان دەست پێکرد و پەیمانی ئاشتی خۆیان شکاند.

بەمشێوەیە بو کەگرتنی ئەسکەندەریە بەدەستی موسوڵمانەکان لای رۆمیەکان دژوار و بەمشێوەیان بەراوەرد کرد دوای لەدەستدانی فەرمانڕەوایەتی لەئەسکەندەریە، ئیتر ناتوانن لەوڵاتەکەی خۆیان خۆڕاگری بکەن. لەبەر ئەمە، لەگەڵ ئەو رۆمیانەی لەئەسکەندەریە بون، دەستیان بەنامەگۆڕینەوە کرد و داوای شکاندنی پەیمانی ئاشتیان لێکردن و خەڵکانی ئەسکەندەریە رازی بون. سوپایەکی گەورە لەکۆنستانتین نۆپێل (قوستەنتەنیە) بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت کەفەرماندەییەکەی لەدەستی مەنەویلی ئەختەدا بو. سوپاکە لەلەنگەرگەی ئەسکەندەریە لەنگەریان گرت. ئەو رۆمیانەی لەم شارەدابون، لەگەڵ ئەمان رێککەوتن. مەقوقس لەگەڵ ئەوان هاوکاری نەکرد بەڵکو پێبەندی ئاشتینامەکەی خۆی بو. کاتێك ئەم هەواڵە بەعەمرۆ کوڕی عاص گەیشت، روبەرویان بویەوە. دولای شەڕکەر چاویان بەیەك کەوت و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. رۆمیەکان شکەستیان خوارد و موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتن تا ناو ئەسکەندەریە راویان نان. لەناوشاردا بەقورسی کوشتاریان کردن. لەناو ئەوان مەنەویلی ئەختە کوژرا. ئەو کاتەی رۆمیەکان لەئەسکەندەریە هاتبونەدەر، سامانی خەڵکی ئەوشارەیان بەزۆر داگیر کردبو. کاتێك موسوڵمانان بەسەر ئەواندا زاڵبون، خەڵکی ئەو شارانەی لەگەڵ رۆمیەکان ناسازگاریان نواندبو، رۆشتنە لای عەمرۆ کوڕی عاص و وتیان: رۆمیەکان چوارپێ و مەڕوماڵات و سامانی ئێمەیان داگیر کردوە بەڵام ئێمە لەفەرمانبردنی ئێوە پێداگریمان کرد و ناسازگاریمان نەکرد. عەمرۆ کوڕی عاص، دوای وەرگرتنی شایەتەکان، ئەوەی سامانەکەی خۆی دەناسیەوە، بۆی گەڕاندەوە. دواتر بورج و قەڵای ئەسکەندەریەی وێران کرد و بێ دیوار و بورج بەجێی هێشت.

هەروەها لەم ساڵەدا سەعد کوڕی ئەبی وەقاص هەواڵی پێ گەیشت کەخەڵکانی رەی

دەیانەوێت پەیمانی (ئاگربڕ) بشکێنن و ڕێگەی پەیمان شکێنی بگرنەبەر. سوپایەکی ڕەوانە کرد و ئەوانی هێنایەوە سەر ڕێگەی ڕاست و شەڕی دەیلەمیەکانی کرد و گەڕایەوە.

## لابردنی سەعد لەکوفە و دانانی وەلید کوڕی عوقبە

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەففان، سەعد کوڕی ئەبی وەققاصی (بەوتەی دەستەیەك لەمێژونوسان) لەکوفە لابرد ولەجیاتی ئەو وەلید کوڕی عوقبە کوڕی ئەبی موعیتی دانا. ناوی ئەبو موعیت، ئەبان کوڕی ئەبی عەمرۆیە و ناوی ئەبوعەمرۆ زەکوان کوڕی ئومەییە کوڕی عەبدشەمس. وەلید کوڕی عوقبە لەدایکەوە برای عوسمان کوڕی عەففان بو. دایکی ئەم دوانە، ئەروا کچی کورەیز و دایکی ئەمەیان بەیزا کچی عەبدولموتەلیب. هۆکارەکەی ئەوەبو سەعد کوڕی ئەبی وەققاص لەعەبدالله کوڕی مەسعود لەسامانەکانی گەنجینە قەرزێکی وەرگرت. کاتێك ئەبو مەسعود داوای قەرزەکەی کرد، سەعد نەیتوانی بیداتەوە. دەمەقاڵێ لەناو ئەواندا دروست بو. سەعد وتی: دەبینم لەم کارە شتێك جگە لەزیان دروست نابێت، ئایا تۆ کوڕی مەسعودیت یا کۆیلەیەك لەهوزەیل؟ وتی: کوڕی مەسعود و تۆ کوڕی حومەینەی. هاشم کوڕی عەتەبە کوڕی ئەبی وەققاص لەم شوێنەدا ئامادە بو. وتی: ئێوە هەردوك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص)ن. ئێستا پێغەمبەر(ص) سەیری ئێوە دەکات. سەعد کەپیاوێکی تورە بو، دەستی خۆی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و دۆعای لەعەبدالله کرد. سەعد وتی: ئەی خوایە، ئەی پەروەردگاری ڕەوی وئاسمان! کوڕی مەسعود وتی: هاوار لەتۆ، قسەی باش بکە و نفرین مەکە. لەم کاتەدا سەعد وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خۆپارێزی لەخوا نەدەبو، بەشێوەیەك نفرینم دەکردی، خێر و خۆشیت لەژیاندا نەدەبینی. عەبدالله پشتی تێکرد و ڕۆیشت. عەبدالله داوای هاوکاری لەچەند کەسێك کرد تا قەرزەکەی وەربگرێتەوە و سەعدیش داوای هاوکاری لەچەند کەسێك کرد تا مۆڵەتی زیاتری پێبدات. ئەم دوانە لەیەك جیابونەوە و بەردەوام سەرکۆنەی یەکیان دەکرد. ئەوان سەعدیان سەرکۆنەدەکرد و ئەمان عەبدالله. ئەمە یەکەم ڕوداوبو لەناو خەڵکانی کوفە ڕقی لێکەوتەوە و یەکەم جار بو دێو ئاژاوە بخاتە ناو خەڵکی کوفە. ئەم هەواڵە بەعوسمان گەیشت و لەهەردوکیان تورە بو. سەعدی

لەسەر کارەکەی لابرد و عەبدالڵەی هێشتەوە و لەجیاتی سەعد وەلید کوڕی عوقبە کوڕی ئەبی موعیتی دانا. ئەو بەنوێنەرایەتی لەعومەر فەرمانڕەوایی عەربەکانی جەزیرە بو و عوسمان کوڕی عەفان لەپێگەیەك دوای ئەو. وەلید وەك فەرماندار هاتەکوفە و پێنج ساڵ لەسەر ئەم کارە مایەوە. خەڵکی کوفە ئەویان زیاتر لەهەموان خۆش دەویست. کاتێك گەیشتە کوفە، سەعد پێی وت: ئایا تۆ دوای ئێمە زرنگ بویت یا ئێمە دوای تۆ نەزان بوین؟ وەلید وتی: ئەی ئەبوئیسحاق، بەم شێوە مەبە، هیچ کام لەم دوگومانە نەبو بەڵکو ئەمە یاسای وڵات بەڕێوبردنە، بەیانی باوەش بۆ دەستەیەك دەکاتەوە و شە و بۆ دەستەیەکیتر. سەعدی وتی: دەبینم کەئێوە (ئۆمەوییەکان) خەلافەتی ئیسلامیتان بۆ پاشایەتی گۆڕیوە! کوڕی مەسعود پێی وت: نازانم تۆ لەدوای ئێمە چاکەکار بویت یا خەڵك خراپەکار بون!

## ئاشتی ئەرمەنستان و ئازەربایەجان

کاتێك عوسمان وەلیدی لەکوفەدانا، عەتەبە کوڕی فەرقەدی لەفەرمانداری، ئازەربایەجان لابرد. خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی خۆیان شکاند. وەلید لەساڵی ٦٤٦/٢٥ زایینی سوپای کردە سەر ئەوان. عەبداللە کوڕی شوبەیلی ئەحمەسی فەرماندەیی پێشەنگەکانی لەدەستدابو. ئەو هێرشی کردە سەر خەڵکانی موغان و بەبر و تیلسان وەدستی بەسەردا گرتن و تالانی و ئەسیری زۆری گرت. خەڵکی شارەکانی ئازەربایەجان خوازیاری ئاشتی بون، ئەو لەسەر بنەمای ئاشتی حوزەیفە لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی مۆر کرد کەهەشتسەد هەزار درەم بو. هەمو ئەم سامانەی وەرگرت. دواتر سوپاکەی رەوانەی شەڕ کرد. سلێمان کوڕی رەبیعەی باهلی لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەر، بۆ شەڕی خەڵکی ئازەربایەجان رەوانە کرد. ئەو ڕۆشتە قولایی ئەرمەنستان و بەردەوام کوشتاری کرد و ئەسیری گرت و تالان کردنی کردە پیشە. دواتر بەدەستی پڕ گەڕایەوە بۆ لای وەلید. وەلید سەرکەوتوو و بەدەستانی پڕتالانی گەڕایەوە و ڕێگەی خۆی بەردو موسڵ خوار کرد. ڕۆشتە حەدیسە و لەوێ دابەزی. لێرەدا نامەی عوسمانی بەدەست گەیشت. لەنامەکەدا وترابو: معاویە هەواڵی بۆ ناردوم کەرۆمیەکان بەسوپایەکی گەورە ئاهەنگی شەڕی موسوڵمانانیان کردوە. دەمەوێت براکانیان لەخەڵکانی کوفە هاوکاریان بکەن.

پیاوێکی بەهێز هاورێ لەگەڵ هەشت یا نۆ هەزار سەرباز، لەو شوێنەی نامەکەم بەدەستت دەگات، بۆ هاوکاری معاویە رەوانە بکە. لەگەڵ سڵاو و رێز.

وەلید لەناو خەڵك هەستا و ئەوانی ئاگادار کردەوە و داوای لێکردن لەگەڵ سلێمان کوڕی رەبیعەی باهلی بڕۆن. هەشت هەزار پیاوی شەڕکەر لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن تا لەگەڵ خەڵکی شام ڕۆشتنە ناو سەرزەمینیە رۆم و هێرشیان کردەسەر. خەڵك تاڵانی زۆریان بەدەست هێنا و دەستیان بەسەر قەڵای جۆراوجۆردا گرت.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی سلێمان کوڕی رەبیعەی باهلی بۆ هاوکاری حەبیب کوڕی موسلیمە نارد، سەعید کوڕی ئەلعاص بو. هۆکارەکەی ئەوەبو عوسمان بۆ معاویە کوڕی ئەبی سوفیان نامەی نوسی و فەرمانی پێدا حەبیب کوڕی موسلیمە هاورێ لەگەڵ خەڵکانی شام بۆ شەڕ لەئەرمەنسستان رەوانە بکات. ئەو ڕۆشتە ئەرزەروم( قالیقلا)، گەمارۆیدا و گوشاری خستە سەر دانیشتوانەکەی. ئەوان خوازیاری ئەماندان، یا کۆچ کردن و یا دانی باج بون. زۆربەی ئەوان بۆ سەرزەمینی رۆم کۆچیان کرد و حەبیب و هاورێکانی بۆ ماوەی یەك مانگ لەوێ مانەوە.

بۆیە بەم شارەیان دەوزت قالیقلا چونکە ژنی بەتریقی ئەرمیناکس کەناوی قالی بو، ئەم شارەی بونیات نا. ئەو، ئەم شارەی بەقالی قولە (بەباش دانراوی قالی) ناوبرد. عەرەبەکان ناوەکەیان کردە عەرەبی و بۆ قالقلا گۆڕیان.

دواتر هەواڵی پێگەیشت کەبەتریقی ئەرمیناکس لەگەڵ هەشتا هەزار پیاوی شەڕکەر لەرۆمیەکان ئاهەنگی ئەویان کردوە. ئەمە ئەو سەرزەمینەیە کەئێستاکە لەژێر دەستی منالەکانی سوڵتان قەلەج ئەرسەلانە و ئەم شارانە دەگرێتەوە: مەلتیە، سیواس، ئەقصرا، قونیە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری تا کۆنستانتین ئۆپێل. ناوەکەی موریانە. حەبیب هەواڵی نارد. عوسمان کەسی بۆلای سەعید کوڕی عاص نارد و فەرمانی پێدا هاوکاری حەبیب کوڕی موسلیمە بکات. ئەو سلێمان کوڕی رەبیعەی لەگەڵ شەش هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ هاوکاری حەبیب رەوانە کرد. حەبیب بڕیاریدا شەوانە و لەناکاو هێرش بکاتە سەر رۆمیەکان. ژنەکەی دایکی عەبداللەی کەلابی لەمەبەستەکەی ئاگادار بویەوە. لەهاوسەرەکەی پرسی: شوێنی دیاریکراوی تۆ کوێیە؟ وتی: سەراپەردەکانی موریان. حەبیب شەوانە هێرشی کردە سەریان و هەرکەسێك بەرگری کرد، کوشتاری کرد. دواتر

ڕۆشتە ناو سەراپەردەکان و بینی ژنەکەی پێشتر گەشتۆتە ئەوێ. ئەو یەکەم ژنی عەرەبی بو سەراپەردەکانیان بۆ هەڵدا. حەبیب مرد و ئەم ژنەی لەدوای خۆی بەجێهێشت. دوای ئەو زوحاك کوڕی قەیس پەیوەندی هاوسەریەتی لەگەڵ بەست و ئەم ژنە چەندین منالی بۆهێنایە دونیا.

کاتێك ڕۆمیەکان شکەستیان خوارد، حەبیب گەڕایەوە ئەرزەروم و لەوێوە بەرێکەوت تا لەموڕی سەردوە دابەزی. لێرە بەتریقی خەلات ڕۆشتەلای و ئەمان نامەی عەیاز کوڕی غەنەمی نیشاندا. ئەو ڕێزی لەئەمان نامەکە گرت. بەتریق هەمو سامانەکانی بۆ هێنا. حەبیب لەخەلات دابەزی. دواتر لەوێ بەرێکەوت و خاوەنی مەکس کەهەمان بوسفورجانە، روبەروی بویەوە و لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی ولاتەکەی پەیمانی لەگەڵ بەست. لەوێوە بەرێکەوت و ڕۆشتە ئەزد شات. ئەزد شات، ئەو گوندیە بەردنگە سوڕەکەی رەنگ دەکەن. ئەو لەسەر روباری دەبیسل دابەزی و سوارکارانی بەرەو ئەو شارە رەوانە کرد و گەمارۆی خستەسەر. خەڵکەکەی لەقەلاکاندا خۆیان حەشاردا. ئەو کەشکەنجیری ( کونکەری کۆشك، جۆرە چەکێکی شەڕ لەکۆندا کەتۆپی گڕاوی دەهاویشت و بەهۆیەوە قەلا و دیوارەکانیان دەروخاند) بەکار برد. خەڵکەکەی داوای ئەمانیان کرد. حەبیب رازی بو و سوپاکەی بۆ داگیر کردنی ناوچەکانی دیکە ردوانە کرد. سوارەکانی گەشتنە زات ئەللەجم (هەوسار کەرەوەکان). موسوڵمانان لەگەڵ ڕۆمیەکان شەڕیان کرد و بەسەریاندا سەرکەوتن. سوپایەکیان بۆ (سراج طیر) و بەغردوەند ردوانە کرد کەبەتریقەکەی لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. هەروەها بەتریقی بوسفورجان هاتە لای و لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی هەمو زەویەکانی خۆی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن.

دواتر ڕۆشتە سیسحان و لەگەڵ خەڵکەکەی شەڕی کرد و شکەستی پێهێنان و دەستی بەسەر قەلاکانی ئەواندا گرت. لەوێوە بەرەو جەرزان (خەزەران) بەرێکەوت کەنێردراوی بەتریق گەشتە لای و داوای ئاشتی کرد. دواتر روی کردە تفلیس و لەگەڵ خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی بەست. ئەم سەرزەمینە لەشارەکانی جەرزانە. لێرە دەستی بەسەر چەندین قەلا و شارەکانی دەوروبەری گرت. سلێمان کوڕی رەبیعەی باهلی بەرەو ئەران بەرێکەوت و بەشێوازێکی ئاشتیانە دەستی بەسەر بیلیقاندا گرت و ئەمانی بەخەڵکەکەی بەخشی لەسەر بنەمای پارێزراوبونی خوێن و سامان و باخەکانیان و

باجی لەسەر دیاری کردن.

دواتر سلێمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی رویکردە شاری بەرزەعە و لەسورسور سوپاکەی دابەزاند. ئێرە روبارێکە کەدوریەکەی تابەرزەعە یەك فەرسەنگ رێگایە. خەڵکەکەی بۆ ماوەیەك شەڕیان لەگەڵ کرد و ئەو هێرشی کردە سەر دێهاتەکان و دانیشتوانەکەی لەسەر بنەمای ئاشتی بیلیقان ئاشتیان لەگەڵ بەست و ڕۆشتە ناو دێهاتەکان. سوارەکانی خۆی رەوانە کرد تا دەستیان بەسەر دێهاتەکانی ئەو پارێزگایەدا گرت. پێشنیاری ئیسلام بونی بەکوردەکانی بلاشجان کرد کەشەڕیان لەگەڵ کرد بەلأم ئەو بەسەریاندا سەرکەوت و لەسەر بنەمای دانی باج دەستەیەك لەوانی هێشتەوە. کەمینەیەکیان بەدانی خێر و خێرات بەسەندەیان کرد. سوپایەکی بۆ گرتنی شەمکور رەوانە کرد و دەستی بەسەر ئەم شارە مێژووییەدا گرت. ئەم شارە بەردەوام ئاوەدان بو تا سەناوەردیەکان (شناوەردیەکان، ساوەردیەکان) کردیانە وێرانە. ئەمانە خەڵکانێك بون کاتێك یەزید کوری ئەسید لەئەرمەنستان گەڕایەوە. کۆبونەوە و دەسەلأتیان بەهێز بو. ماوەیەك زۆر دواتر لەساڵی ٨٥٥/٢٤٠ زایینی (بەغا) سەرلەنوێ ئاوەدان و نۆژەنی کردەوە و لەروی ناوی خەلیفەی عەباسی ئەلموتەوەکیل ناوی نا متوەکلیە.

سلێمان بەرێکەوت تا گەشتە ئەرەس و کوڕ و دەستی بەسەر قیبلەدا گرت و خاوەنەکانی سەکر و هاوشێوەکانی بەئاشتی پێشوازیان لێکرد لەسەر ئەو بنەمایە کەباج بدەن. هەروەها پاشای شێروان وپاشاکانی دیکەی کوێستانەکان و پیاوەکانی مەسقەت و شابەران و شەهرباب پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. ئەمەیان، ماوەیەك دواتر لەبەرابەر ئیسلامیەکان خۆڕاگریان کرد.

## شەڕی معاویە لەگەڵ رۆمەکان

معاویە بۆ شەڕی رۆمیەکان بەرێکەوت و گەشتە عەموریە و بینی قەلأکانی نێوان ئەنتاکیە تا تەرسو خاڵیە. لەوێ دەستەیەکی زۆر لەخەڵکانی شام و جەزیرەی دانا تا لەشەڕەکانی خۆی گەڕایەوە. دواتر یەزید کوڕی حوڕی عەبەسی بۆ شەڕی سایفە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا ئەو کارەی ئەم بکات. کاتێك هاتەدەر، هەمو قەلأکانی ئەنتاکیەی لەگەڵ خاك تەخت کرد.

## شەڕی ئەفریقیە

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عاص، عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرحی بۆ دەوروبەرەکانی ئەفریقیە ڕەوانەکرد و بەفەرمانی عوسمان دەستی بەگرتنی ناوچە جیاوازەکان کرد. عەبدالله لەسوپاکەی میسر بو. کاتێك بەرەو ئەو ناوچانە بەرێکەوت، عەمرۆ بەسوپایەك هاوکاری کرد. ئەو و شەڕکەرەکانی تالآنی زۆریان دەست کەوت. کاتێك عەبدالله گەڕایەوە، نامەی بۆ عوسمان نوسی و داوای فەرمانی لێکرد تا لەئەفریقیە پێشڕەوی بکات. عوسمان فەرمانی پێدا.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عوسمان، عەبدالله کوڕی عامری ڕەوانەی کابول کرد کە لەشارەکانی سیستانە. بەوتەی دەستەیەك، عەبدالله گەشتە کابول. کابول گەورەتر بو لەخوراسان. بەمشێوە بو تامعاویە مرد و خەڵکەکەی خۆڕاگریان کرد.
هەروەها لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە لەدایك بو. لەم ساڵەدا یەکەم شەڕ لەگەڵ شاپور رویدا. دەستەیەك دەڵێن: ئەم شەڕە لەساڵی ٦٤٧/٢٦ زایینی رویدا کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

## روداوەکانی ساڵی بیست و شەشەمی کۆچی (٦٤٧ زایینی)

### فراوان بون لەبارەگایی خوایی

لەم ساڵەدا عوسمان فەرمانیدا ستون و نیشانەکانی بارەگایی خواییان نۆژەن کردەوە. هەروەها لەم ساڵەدا عوسمان مزگەوتی حەرامی فراوان کرد وپەرەی پێدا. زەوی و ماڵی چەندین کەسی کڕی. دەستەیەك نەیانفرۆشت کەماڵەکانی بەسەردا وێران کردن و بەهای ماڵەکانی لەگەنجخانە پێدان. ئەوان بەسەر عوسماندا قیژاندیان بەلآم ئەوانی زیندانی کرد وپێی وتن: عومەر ئەم کارەی لەگەڵ کردن بەلآم بەسەر ئەودا نەتانقیژاند. عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید بوبەنێوەنجیگەر وسەبارەت بەوان قسەی لەگەڵ عوسمان کرد و عوسمان ئەوانی ئازاد کرد.

# روداوەکانی ساڵی بیست و حەوتەمی کۆچی (٦٤٨ زایینی)

## فەرمانداری عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لەمیسر

## گرتنی ئەفریقیە

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عاص لەمیسر لەسەر کار لابرا و عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح هاتە سەر کار. ئەو برای شیر خواردوی عوسمان بو. کێشە لەنێوان عەبدالله و عەمرۆ دروست بو. عەبدالله نامەی بۆ عوسمان نوسی کە: عەمرۆ لەودرگرتنی باج و خەراج کەمتەرخەمی دەکات. عوسمان عەمرۆ کوڕی عاصی لەسەر کار لابرد و بۆ مەدینە بانگێشتی کرد و لەجیاتی ئەو عەبداللەی کردە فەرمانڕەوای پادگانەکانی میسر و سەرپەرەستی باج کۆکردنەوە. عەمرۆ توڕە گەڕایەوە بۆ مەدینە و گەیشتە لای عوسمان و لەم کاتەدا عابایەکی لەبەردابو کەتوێیەکی لێوانلێو بو لەپەمو. عوسمان پرسی: چی لەناو عاباکەتدایە؟ وتی: عەمرۆ. عوسمان وتی: دەزانم عەمرۆی تیایە، پرسیاری ئەوەم نەکرد، ویستم بزانم بەپەمو پڕکراوە یا هەوریشم و هاوشێوەکانی.

عەبدالله لەسوپاییەکانی میسر بو. عوسمان لەساڵی ٦٤٦/٢٥ زایینی فەرمانی هێرش کردنە سەر ئەفریقیەی پێدابو. پێی وتبو: ئەگەر خواوەند سەرکەوتن بەتۆ ببەخشێت، پێنج یەك لە پێنج یەکەکە بەهرەی خۆت بێت. عەبدالله کوڕی نافع کوڕی عەبدئەلقەیس و عەبدالله کوڕی نافع کوڕی حەرەسی کردە فەرماندەی سوپاکە و ئەوانی بەرەو ئەندولۆس رەوانە کرد و فەرمانی پێدان هاورێ لەگەڵ عەبدالله کوڕی سەعد هێرش بکەنە سەر خواوەندەکانی ئەفریقیە و دواتر عەبدالله لەسەر کارەکەی خۆی بمێنێتەوە. ئەوان بەرێکەوتن و سەرزەمینی میسریان بڕی و خاکی ئەفریقیەیان خستە ژێر پێی خۆیان. ئەو فەرماندەی سوپایەکی گەورە بو کەپیاود شەرکەرەکانی بەدەهەزار کەس مەزندە دەکرا. لەبوێرترین پیاوەکانی سوپای ئیسلام بون. خەڵك لەسەر بنەمای دانی ئەندازەیەك لەسامانەکەیان پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەستن.

موسوڵمانان مەبەستی ڕۆشتنە ناو قوڵایی ئەفریقیەیان نەکرد چونکە ژمارەی خەڵکەکەی فراوان بو.

دواتر کاتێك عەبداللە کوڕی سەعد هاتە سەر کار، پەیك و پەیامی بۆ لای عوسمان رەوانە کرد و داوای فەرمانی لێکرد تا لەقوڵایی ئەفریقییە بڕواتە پێش و شەڕ بکات و بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی گەورە کۆبکاتەوە تا دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرێت. عوسمان لەگەڵ سیان لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) راوێژی کرد. زۆربەیان دەنگیان لەسەر ئەم کارەدا. عوسمان لەمەدینەوە سوپایەکی بۆ هاوکاری عەبداللە رەوانە کرد کە لەناویدا ژومارێەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) وەك عەبداللە کوڕی عەباس و کەسانیتر دەبینران. عەبداللە کوڕی سەعد ئەوانی بۆ ئەفریقیە برد. کاتێك گەشتنە بەرەقە، عەقبە کوڕی نافع و موسوڵمانەکانی هاورێی، کەلەوێ بون، روبەروویان بونەوە و پێشوازیان لێکردن. موسوڵمانان بەرەو تەرابلوسی رۆژئاوا بەرێکەوتن و رۆمیەکانی ئەو ناوچەیان تالآن کرد. عەبداللە بەرەو ئەفریقییە بەرێکەوت و سوپاکەی بۆ هەر ناوچەیەك رەوانە کرد. ئەوان پاشایەکیان بو بەناوی جەرجیر و سنوری پاشایەتیەکەی لەتەرابلوس تا تەنجەی دەگرتەوە. هراکلیویس پاشای رۆم ئەوی لەئەفریقییە دانابو و ئەم پاشایە سالآنە باجی خۆی بۆ دەرباری رۆم رەوانە دەکرد. کاتێك هەواڵی گەشتنی موسوڵمانەکانی پێگەیشت، خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و سوپاییەکان و خەڵکی شارەکانی کۆکردەوە. ژمارەی سوپاکەی بەسەد و بیست هەزار سوار مەزندە دەکرا. ئەو لەشوێنێك روبەروی موسوڵمانەکان بویەوە کە تاشاری سەبیتڵە شەو و رۆژێك رێگابو. ئەم شارە لەو کاتەدا پایتەخت بو. لەوێ مانەوە و هەمو رۆژێك شەڕیان دەکرد. عەبداللە کوڕی سەعد لەگەڵ جەرجیر دەستی بەنامە گۆڕینەوە کرد و پێشنیاری ئیسلام یا باجی پێکرد. ئەو خۆی بەدور گرت و بەهیچ کام لەمانە رازی نەبو.

هەواڵی موسوڵمانان بەعوسمان نەدەگەیشت. لەبەر ئەمە، عەبداللە کوڕی زوبەیر کوڕی عەوامی لەگەڵ دەستەیەك بەدوای ئەواندا رەوانە کرد تا لەهەواڵەکانی ئەوان ئاگاداری بکەنەوە. عەبداللە بەخێرایی بەرێکەوت و خۆی بەوان گەیاند و لەگەڵ ئەوان مایەوە. کاتێك گەیشت، دەنگی تەکبیر و هاواری موسوڵمانان گەیشتە ئاسمان. جەرجیر پرسیاری کرد کەچی رویداوە. پێی وترا، موسوڵمانان هێزی پشتیوانیان پێگەیشت. عەبداللە کوڕی

زوبەیر بینی موسوڵمانان هەموڕۆژێك لەبەیانی تا نیمەڕۆ شەڕ دەکەن و کاتێك بانگی نوێژی نیمەڕۆ بەگوێ دەگات، هەر سوپایەك رودەکاتە خێودتەکانی خۆی. سەیری شەڕی بەیانی کرد و عەبدالله کوڕی ئەبی سەرحی لەگەڵ ئەواندا نەبینی. پرسیاری بۆ کرد. پێی وترا: جارچیەك لەلایەن سوپاکەی جەرجیرەوە جاریدا کەهەر کەس عەبدالله کوڕی ئەبی سەرح بکوژێت، سەد هەزار دیناری پێ دەبەخشم و کچە جوانەکەی خۆم دەکەمە هاوسەری. لەبەر ئەمە عەبدالله دەترسێت. زوبەیر ڕۆشتە لای عەبدالله و فەرمانی پێدا بەجارچیەك بڵێت تا جار بدات، هەرکەس سەری جەرجیر بۆ من بێنێت، سەد هەزار دیناری پێدەبەخشم و کچە جوانەکەی پاشا دەکەمە هاوسەری و دەیکەمە پاشای ئەم وڵاتە. عەبدالله ئەم کارەی کرد. دوای ئەوە جەرجیر زیاتر لەعەبدالله لەخۆی دەترسا.

عەبدالله کوڕی زوبەیر بەعەبدالله کوڕی سەعدی وت: شەڕی ئێمە لەگەڵ ئەم خەڵکە بەردەوام دەبێت چونکە ئەوان بەردەوام هێزی پشتیوانیان بۆدەگات. ئەوان لەسەر خاکەکەی خۆیان شەڕ دەکەن بەلاّم ئێمەی موسوڵمان لەسەرزەمینەکانی خۆمان دورکەوتوینەتەوە. بۆچونم وایە بەیانی بەمشێوەیە شەڕ بکەین: دەستەیەکی شیاو لەپاڵەوانە موسوڵمانەکان بەئامادەیی تەواو بۆ شەڕ لەناو خێوەتەکانیان بەجێبێڵین و خۆمان شەڕ لەگەڵ ڕۆمیەکان دەست پێبکەین تا ئەوان هیلاك وبێزار ببن. کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ خێوەتەکانی خۆیان و موسوڵمانانیش دەگەڕێنەوە، ئەو سوپایە لەموسوڵمانان کەلەناو خێودتەکاندان و حەساوەن و شەڕیان نەکردوە، لەناکاو هێرش بکەنە سەر سوپای ڕۆمیەکان ئەگەری هەیە خوا ئەوان سەرکەوتو بکات. ئەو دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص)ی بانگ کرد و راوێژی لەگەڵ کردن و بەکۆی دەنگ ئەم پیلانەیان پەسەند کرد.

کاتێك بەیانی داهات، عەبدالله ئەو کارەی خستە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە کە لەسەری ڕێککەوتبون. ئەو بوێرەکانی سوپای ئیسلامی لەخێوەتەکاندا هێشتەوە و ئەسپەکانیان زین کراو لەبەردەرگای خێوەتەکان ئامادە کران. کەسانیتر ڕۆشتن و شەڕی ڕۆمیەکانیان دەست پێکرد و شەڕێکی قورستریان لەرۆژانی پێشو هەڵگیرساند. ئەم کارە تا نیمەڕۆ درێژەی کێشا. کاتێك بانگدەر بانگی نیوەری دا، ڕۆمیەکان وەك ڕۆژانی پێشو ئاهەنگی

گەڕانەوەیان کرد بەڵام کوڕی زوبەیر مۆڵەتی پێنەدان بەڵکو لەسەر شەڕ پێداگری کرد تا بەتەواوی هیلاکی کردن. دواتر ئەو و موسوڵمانان گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. هەرکام لەدوسوپا کەل و پەلەکانی شەڕیان دانا و حەوانەوەیان دەستپێکرد. لەم کاتەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر پاڵەوانەکانی سوپای ئیسلامی هەڵگرت و ئاهەنگی ڕۆمیەکانی کرد. ڕۆمیەکان نەهاتبونە خۆیان کەموسوڵمانەکان گەشتنە سەریان و هاوشێوەی پەیکرێکی تاقانە هێرشیان کردە سەریان و بەردەوام تەکبیریان دەوت. ڕۆمیەکان نەیانتوانی خۆیان بۆ شەڕ ئامادە بکەن و موسوڵمانان ئەوانیان گەمارۆدا و جەرجیر کوژرا. کوڕی زوبەیر ئەوی کوشت. ڕۆمیەکان شکەستیان خوارد و بەسەختی کوشتار کران وکچی جەرجیری پاشا بەدیلی گیرا. عەبدالله کوڕی سەعد شەڕی لەناو شار دەسپێکرد و گەمارۆی خستەسەر و دەستی بەسەردا گرت. لەو شارە بەئەندازەیەك سامانی دەست کەوت کەهاوشێوەکەی نەبینیبو. سوارەکان هەرکام سێ هەزار دینار و پیادەکان هەزار دیناریان پێبڕا.

کاتێك عەبدالله دەستی بەسەر سەبیتڵەدا گرت، سوپاکەی خۆی بۆ هەمو شارەکان ڕەوانە کرد تا گەشتنە قەفصە و لەوێ ئەسیر و تالآنی زۆریان دەستکەوت. سوپایەکی بۆ قەلآی (ئەجەم) ڕەوانە کرد کەخەڵکی ئەو سەرزەمینە لەناو قەلآکەدا خۆیان حەشاردابو. گەمارۆیدا و دواتر بەئەمان بەخشین بەدانیشتوانەکەی دەستی بەسەرداگرت. خەڵکی ئەفریقییە لەسەر بنەمای دانی دوهەزار هەزار و پێنسەد هەزار (دو ملیون وپێنسەد هەزار) دینار پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. عەبدالله کوڕی زوبەیر دەستی بەسەر کچی پاشادا گرت و ئەوی وەك مژدەی سەرکەوتنی خۆی بۆ لای عوسمان ڕەوانە کرد. دەستەیەك دەڵێن: کچی پاشا دەست پیاوێکی ئەنسار کەوت کەسوار وشترەکەی خۆی کرد و بەردەوام گۆرانی دەخوێند و دەیوت:

یا ابنة جرجیر تمشی عقبتك      ان علیك بالحجاز ربتك

لتحملن من قباء قربتك

یانی:

ئەی کچی جەرجیر، کاتی سەروەری تۆ کۆتایی پێهات کەبۆ تۆ لەحجاز خاتونێك دیاری

بکەین. بێ گومان روپۆشێك لەبەر دەكەیت كەنیشانەی خزمایەتی تۆ بێت.

دواتر عەبدالله کوڕی سەعد لەئەفریقییە بۆ میسر گەڕایەوە. مانەوەی ئەو لەئەفریقییە یەك ساڵ و سێ مانگی خایاند. موسوڵمانان تەنیا سێ كەسیان لێ كوژرا. لەناو ئەوان ئەبو زوەیبی هەزلی كوژرا كە لەهەمان شوێن بەخاكیان سپارد. پێنج یەكی ئەفریقییەیان بۆ مەدینە ردوانە كرد كەمەروان كوڕی حەكەم بەپێنسەد هەزار دینار كڕیەوە بەلاّم عوسمان بەهاكەی پێبەخشی. ئەمە یەكێك لەو كارانە بو خەڵك رەخنەیان لەعوسمان گرت و بەكارێكی گەورەیان زانی.

ئەمە باشترین قسەیە كەسەبارەت بەپێنج یەكەكەی ئەفریقییە باس كراوە چونكە دەستەیەك لەخەڵكان دەڵێن: عوسمان پێنج یەكی ئەفریقییەی بەعەبدالله كوڕی سەعید بەخشی. دەستەیەك دەڵێن: بەخشی بەمەروان كوڕی حەكەم. لێرەوە ئەوەمان بۆ رون دەبێتەوە كەپێنج یەكی شەڕی یەكەمی ئەفریقییەی بەعەبدالله بەخشی و پێنج یەكی هەمو سامانە تالاّنكراوەكانی لەشەڕی دوەم بەمەروان كوڕی حەكەم. و خوا زاناترە.

## پەیمان شكێنی ئەفریقییە ودوبارە دەست بەسەردا گرتنەوەی

هراكلیوس پاشای قوستەنتەنیە، پاشایەك بو هەمو پاشاكانی مەسیحی باجیان پێدەدا. ئەوان لەمیسر و ئەندولوس و ئەفریقییە و سەرزەمینەكانی دیكە بون. كاتێك خەڵكی ئەفریقییە لەگەڵ عەبدالله كوڕی سەعد پەیمانی ئاشتیان بەست، هراكلیوس بەتریقێكی بۆ ئەم شارە رەوانە كرد و فەرمانی پێدا لەخەڵكەكەی بەئەندازەی موسوڵمانان باج وەربگرێت. ئەم بەتریقە لەقرتاجەنە (كارتاژ) دابەزی و خەڵكی ئەفریقییەی كۆكردەوە و ئەوانی لەفەرمانی پاشا ئاگادار كردەوە. ئەوان رازی نەبون و وتیان: ئەوەی دەبێت لەئێمە وەربگیرێت، داومانە و شیاوە بۆ ئەو بارودۆخ لەسەر ئێمە دژوار نەكات چونكە موسوڵمانان باجمان لێ دەستێنن. دوای كوژرانی جەرجیر، پیاوێكی دیگە لەرۆمیەكان فەرماندەیی ئەفریقییەی گرتەدەست. بەتریق دوای ئاژاوەی زۆر ئەوی دور خستەوە. ئەو هاتە شام و لێرە معاویە كوڕی ئەبی سوفیان فەرمانڕەوایەتی دەكرد كەدوای كوژرانی عەلی كوڕی ئەبی تالیب بارودۆخی بۆ سازگار ببو. وەسفی ئەفریقییەی بۆ

معاویە کرد داوای کرد سوپایەك لەگەڵ ئەودا رەوانە بکات. معاویە کوڕی ئەبی سوفیان سوپایەکی بەسەرکردایەتی حودەیجی سەکونی رەوانە کرد. کاتێك ئەم سوپایە گەشتە ئەسکەندەریە، پاشای رۆم مرد و کوڕی حودەیج بەرێکەوت تا گەشتە ئەفریقیە کەوەك بورکان دەخرۆشا. سوپایەکی گەورەی لەگەڵدا بو. لەقەمونیە دابەزی و بەتریق سی هەزار پیاوی شەڕکەری بۆ روبەروبونەوەی رەوانە کرد. کاتێك معاویە ئەم هەواڵەی بیست، سوپایەك لەموسوڵمانانی بۆ روبەروبونەوەیان رەوانە کرد و بۆ شەڕ ریزیان بەست. رۆمیەکان شکەستیان خوارد و ئەو قەلای جەلەولای گەمارۆدا بەلام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت. قەلاکە روخا و موسوڵمانان دەستیان بەسەرداگرت و هەرچی تیابو وەك تالانی هەڵیان گرت. معاویە بۆ هەر ناوچەیەك سوپایەکی رەوانە کرد و خەڵك ئارام بونەوە و بەفەرمانبرداری ئەو رازیبون. معاویە بۆ میسر گەڕایەوە.

دواتر خەڵکی ئەفریقییە بەردەوام فەرمانبردارترین و گوێرایەڵترینی خەڵکان تا رۆژگاری هشام کوڕی عەبدولەلیك بون تا ئەوەی عێراقیەکان ڕۆشتنە ناویان و ئەوانیان هەڵخراند و لەم کاتەدا ئەفریقیەکان داری فەرمانبەریان شکاند. عێراقیەکان تا ئەمڕۆ لەناو ئەوان دوبەرەکی و جیاییان دروست کرد. خەڵکی ئەفریقییە دەیانوت. لەبەر ئەو تاوانانەی فەرماندارەکان دەیکەن ئێمە نافەرمانی پێشەوا دینیەکانی خۆمان ناکەین. عێراقیەکان بەخەڵکیان دەوت: فەرماندرەکان بەفەرمانی پێشەوا دینیەکان تاوان دەکەن. ئەفریقییەکان وتیان: با ئەوان ئاگادار بکەینەوە. مەیسەرە لەگەڵ بیست و چەند کەسێك بەرێکەوت و ڕۆشتنە لای هشام بەلام مۆڵەتی بینینی ئەویان پێنەدرا. ئەوان ڕۆشتنە لای (ئەبرەش) و وتیان: سەرومری باوەڕداران ئاگادار بکەرەوە کەفەرمانداری ئێمە، ئێمە لەگەڵ سوپاکەی بۆ شەڕ دەبات و دەڵێت: ئەم شێوازەی شەڕ کردن لەرێگای خوادا باشترە. کاتێك گەمارۆی شارێك دەدات، ئێمە پێش دەخات و دەڵێت: ئەم کارە، پاداشتی زیاتری خوایی بەدواوە دێت. دواتر ئەوان هێرش دەکەنە سەر مەڕومالاتەکەی ئێمە و ورگیان هەڵدەدڕن تا پێستەی سپی بۆ سەرومری باوەڕداران بەدەست بێنن. هەزار مەڕ دەکوژن تاپێستەیەك بەدەست بێنن. دواتر بەمشێوەیە ئەشکەنجەیان کردین کەهەمو کچە جوانەکانی ئێمەیان بەزۆر هەڵگرت و بردیان. وتمان: ئەم کارەمان لەنوسراو یا سونەتدا نەبینیوە، ئێمەیش موسوڵمانین. وەلامەمان

بدەرەوە ئایا ئەم هەمو تاوانە بەئاگاداری سەروەری باوەڕداران دەکرێت یا نە. مانەوەی ئەوان زۆری خایاند و خەرجیەکانی ئەوان تەواو بو. لەبەر ئەمە ناوی خۆیان نوسی و دایان بەوەزیرەکان و وتیان: ئەگەر سەروەری باوەڕداران لەئێمەی پرسی، هەواڵەکانی ئێمەی پێ رابگەیێنن. دواتر گەڕانەوە بۆ ئەفریقییە و هێرشیان کردە سەر کارگوزارەکەی هشام و کوشتیان و دەستیان بەسەر ئەفریقیەدا گرت. ئەم هەواڵە بەهشام گەیشت. ئەو پرسیاری ئەو چەند کەسەی کرد و ناوەکانی ئەوانی ناسیەوە و بینی ئەو کەسانەن کەکارگوزارەکەی ئەویان کوشتوە.

## هێرش کردنە سەر ئاندولوس

کاتێك ئەفریقییە دەستی بەسەرداگیرا، عوسمان فەرمانی بەعەبداللە کوڕی نافع کوڕی حەصین و عەبداللە کوڕی نافع کوڕی عەبدولقەیسدا تا ڕەوانەی ئاندولوس ببن. ئەمە دوانە لەرێگەی دەریاوە گەشتنە ئەو سەرزەمینە. عوسمان بۆ هاورێکانی ئەوانی نوسی: تەنیا لەرێگەی ئاندولوسەوە دەتوانین دەست بەسەر قوستەنتینەدا بگرین.
ئەوان لەگەڵ بەربەریەکان هاتنەدەر. خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و بەئەندازەی ئەفریقییە سەرزەمینەکانی ئەوانی زیاد کرد. کاتێك عوسمان عەبداللە کوڕی سەعدی لەفەرمانڕەوایی ئەفریقییە لابرد، جێگەکەی بەعەبداللە کوڕی نافع پڕکردەوە. عەبداللە بۆ میسر گەڕایەوە و سامانە زۆرەکان کەلەوێ کەڵەکەی کردبون، ڕەوانەی عوسمانی کرد. ڕۆژێك عەمرۆ کوڕی عاص ڕۆشتە لای عوسمان. عوسمان پێی وت: ئەی عەمرۆ، ئایا دەزانی، وشترەکان دوای تۆ شیریان دا؟ عەمرۆ وتی: بەچکەکانیان هەموی لەناوچون.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.
هەروەها لەم ساڵەدا بۆ دوەم جار ئیستەخر لەسەر دەستی عوسمان کوڕی ئەبی عاص دەستی بەسەرداگیرایەوە.
لەم ساڵەدا معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بۆ شەڕی قینسرین ڕۆشتەدەر.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبو زومیبی هەزلی وتاردەر لەکاتێکدا لەئەفریقییە دەگەڕایەوە، لەمیسرماڵئاوایی لەجیهان کرد. دەستەیەك دەڵێن: لەرێگەی مەککە و لەبیاباندا مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەسەرزەمینی رۆم. هەموویان مردنەکەی ئەویان لەرۆژگاری عوسماندا ئاماژە پێداوە.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبو رەمسەی بەلوی لەئافریقا مرد. ئەو لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بو.

هەروەها لەم ساڵەدا حەفصە کچی عومەری خەتاب، هاوسەری پێغەمبەر(ص) کۆچی دوایی کرد. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٦١/٤١ یا ٦٦٥/٤٥ زایینی کۆچی دوایی کرد.

## رووداوەکانی ساڵی بیست و هەشتەمی کۆچی(٦٤٩ زایینی)

### گرتنی قوبرس

دەڵێن: لەساڵی ٦٤٩/٢٨ زایینی قوبروس لەسەر دەستی معاویە بەسەرداگیرا. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٥٢/٣٣ زایینی هێرشیان کردە سەر چونکە خەڵکەکەی پەیمانەکەیان شکاند و لەبەر ئەمە موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر ئەو سەرزەمینە. معاویە لەم ساڵەدا هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) و لەناو ئەوان ئەبوزەری غەفاری وعبادە کوڕی سامت (هاورێ لەگەڵ ژنەکەی دایکی حەرام) و ئەبولدەردا و شەداد کوڕی ئەوس، بەمەبەستی هێرش کردنە سەر ئەم ناوچەیە هاتنەدەر. معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بەردەوام زەختی لەعومەر دەکرد تا فەرمانی پێبدات دەریا ببڕێت و لەحمصەوە هێرش بکاتە سەر رۆمیەکان. معاویە پێی وتبو: خەڵك لەهەر کام لەدێهاتەکانی حمص دەنگی قوڵەی سەگ و خوێندنی کەڵەشێرەکانی رۆمیەکان دەبیستن. عومەر بۆ عەمرۆ کوڕی عاصی نوسیبو: دەریا بۆ من وەسف بکە. عەمرۆ کوڕی عاص بۆی نوسی: من ئافرێنراوێکی گەورەم بینیوە کەخەڵکێکی کەم سواری دەبن. جگە لەئاسمان و ئاو هیچ شتێك نابینرێت. ئەگەر لەجووڵە بکەوێت، دڵەکان شەق دەکات و ئەگەر بەردەو پێش بڕوات، عەقڵەکان سەرلێشێواو دەکات. لەوێ دڵنیایی کەم دەبێتەوە و گومان زیاد دەکات. کەشتی سواردکان هاوشێوەی کرمێکی سەر دارن کەئەگەر هەڵبگەڕێتەوە ئەوان نوقم دەکات و ئەگەر رزگاری بێت، چاوەکان زەق دەکات. عومەر دوای خوێندنەوەی نامەکە، بۆ معاویەی نوسی: سوێند بەو کەسەی محەممەدی بەراستی و دروستی نارد، هەرگیز هیچ کات موسوڵمانێك سوار کەشتی ناکەم و منیان ئاگادار کردۆتەوە کەدەریایی شام زۆرترین پانتایی لەسەر زەوی داگیر کردوە و هەمو شەو رۆژێك داوا لەخوا دەکات تا هەمو زەوی دابپۆشێت. چۆن دەتوانم سوپای ئیسلام سوار ئەم خوانەناسە بکەم! سوێند بەخوا موسوڵمانێك لەهەمو ئەو شتانەی لەسەرزەمینی رۆمدایە، لای من خۆشەویستتر و گرنگترە. خۆت گرفتاری من مەکە

چونکە خۆت لەبیرتە چیم لەعەلا کوڕی حەزرەمی کرد.

پاشای رۆم شەڕی پشت گوێ خست و خۆی لەعومەر نزیك کردەوە و نامەی بۆنوسی. دایکی کولسوم کچی سەروەری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کەهاوسەری عومەر بو، ئەندازەیەك بۆنخۆشکەری لەگەڵ هەندێ کەل و پەلی ژنانەی بۆ شاژنی رۆم رەوانە کرد. شاژن، لەبەرابەردا دیاریەکی بۆ دایکی کولسوم نارد کەگەردنبەندێکی گرانبایی تیا بو. کاتێك پەیك گەڕایەوە، عومەر شتەکانی لێوەرگرت و هاواری کرد کە: هەموان بۆ نوێژ کۆببنەوە! خەڵك کۆبونەوە و عومەر ئەوانی ئاگادار کردەوە کەهاوسەرەکەی چی کردوە و چی بۆ هاتوە. وتیان: گەرندبەندە شیاوە بۆ دایکی کولسوم، چونکە ئەو پێشتر دیاری رەوانە کردوە. هیچ شتێکیش لەوەدا نابینرێت کەشاژن لەگەڵ تۆ سازانی کردبێت. کەسانیتر وتیان: ئەگەری بو ئێمەیش ئەگەر دیاریەکمان رەوانە کردایە، باشترمان دەسکەوتایە. عومەر وتی: بەڵام نێردراو نێردراوی موسوڵمانانە و پەیك، پەیکی ئەوان. موسوڵمانان بون دایکی کولسومیان لەبەرچاوی شاژندا گەورە کرد. عومەر فەرمانیدا گەردنبەندەکەیان بۆ گەنجخانە برد. بەهاکەی بەدایکی کولسومدا.

کاتێك رۆژگاری عوسمان گەیشت، معاویە کوڕی ئەبی سوفیان چەندین جار نامەی بۆ نوسی و داوای لێکرد تا بڕواتە ناو دەریا و شەڕی رۆمیەکان بکات. عوسمان درەنگ وەڵامی دایەوە و نوسی: کەس هەڵمەبژێر و کەس لەناو ئەوان بەزۆر مەبە. ئەوان سەرپشك بکە تا هەر کەس بەدڵخواز شەڕی هەڵبژارد، سوار بێت و هاوکاری بکەیت. معاویە ئەم کارەی کرد و عەبدالله کوڕی قەیسی جاسی هاوپەیمانی فەزارەی وەك فەرماندە دەستنیشان کرد. موسوڵمانان بەرەو قوبروس بەرێکەوتن و عەبدالله کوڕی سەعد لەمیسرەوە بۆ ئەو ناوچەیە بەرێکەوت. لەوێ کۆبونەوە و لەگەڵ خەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی باج بەرابەر بەحەوت هەزار دینار لەساڵ، پەیمانی ئاشتیان بەست. موسوڵمانان رێگر نەبن لەوان و لەبەرابەر هیچ کەس و سوپایەك پارێزگاریان لێ نەکەن. لەسەر ئەوانە موسوڵمانان لەجموجۆڵی رۆمیەکان ئاگادار بکەنەوە و رەوانە بونی موسوڵمانان بۆ سەرزەمینی رۆمیەکان لەناو سەرزەمینەکانی ئەمانەوە بێت.

جۆبەیر کوڕی نوفەیر دەڵێت: کاتێك قوبروس دەستی بەسەرداگیرا و کەسانی زۆری تیا دیل کرا، سەیری ئەبولدەردام کرد و بینیم دەگری. پێم وت: بۆ لەرۆژێك کەخوا شکۆ و

سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشیوە، دەگریت؟ دەڵێت: ئەو دەستێکی خستە سەرشانم و وتی: چەندە سوکن ئەو خەڵکانەی فەرمانەکانی خوا پشت گوێ دەخەن! ئەوانە کەخەڵکانێکی سەرکەوتوو و بەختەوەر و پاشایەتیەکەی بەشکۆیان بو، لەبەر ئەوەی فەرمانی خوایان خستە ژێرپێ. گیرۆدەی چارەنوسێك بون کەدەیبینی. خوا ئەسیری کردە بەشی ئەوان و کاتێك خوا خەڵکانێك گرفتاری ئەسیری دەکات، هیوایان بەهیچ نامێنێت.

لەم شەڕەدا دایکی حەرامی ئەنساری کچی مەلحان مرد. ئێسترەکەی لەدورگەی قوبروس فڕیدایە خوار کەملی شکا و لەزیانەکەی کۆچی دوایی کرد. ئەم روداوە، بوە هۆی راست بونی ئەو هەواڵەی کەپێغەمبەر(ص) پێدا و وتی: یەکەم کەسیت کە لەشەڕی دەریا لەناو دەچیت.

عەبداللە کوڕی قەیسی جاسی لەدەریا مایەوە و پەنجا هێرشی زستانە و هاوینەی لەوشکایی و دەریاوە رێکخست. هیچ کەس لەئاودا نەخنکا و گرفتاری بەدبەختی نەبو. ئەو لەخوا بۆ سوپاییەکان دەپاڕایەوە تا بەتەندروستی بیانهێڵێتەوە. خوا وەڵامی دۆعاکانی دایەوە. کاتێك خوا مەبەستی ئەوەی کرد زیان لەجەستەی ئەو بدات، ئەو وەك پێشەنگ لەگەڵ بەلەمێك ڕۆشت و گەشتە لەنگەرگەیەك لەسەرزەمینی رۆم کەتیایدا هەژارەکان سواڵیان دەکرد. بەخششەکانی خۆی بەوان بەخشی. ژنێك لەوان بۆ دێهاتەکەی خۆی گەڕایەوە و بەپیاوەکانی وت: عەبداللە کوڕی قەیس لەلەنگرگەیە. ئەوان گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر و دوای شەڕێکی قورس، ئەویان کوشت. ئەو بەتەنیایی کوژرا و بەلم لێخوڕەکە رزگاری بو و گەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی و ئەوانی ئاگادار کردەوە. ئەوان هاتن و لەو لەنگەرگەیە لەنگەریان گرت. سەرپەرەستی ئەوان سوفیان کوڕی عەوف ئەزدی بو. ئەو ڕۆشتەدەر و شەڕی ئەوانی دەسپێکرد، سەرئەنجام بێزار و دەستی بەجوێن دان بەهاوەڵانی خۆی کرد. کەنیزەکەی عەبداللە کوڕی قەیس وتی: ئەو لەکاتی شەڕ ئەم کارەی نەدەکرد. سوفیان پرسی: چی دەوت؟ کچی وتی: لەدژواریەکاندا نوقم بن چونکە دوای ئەوە رزگار بونە. ئەو کچەکەی ناچار بەوتەکەی کرد. ئەو رۆژە چەندین کەس لەموسوڵمانان کوژران. ماوەیەك دواتر بەو ژنە وترا: ئەوت چۆن بینی؟ وتی: هاوشێوەی بازرگان بو بەلأم کاتێك لێی پاڕامەوە،

هاوشێوەی پاشاکان منی بەخشی و ئەوم بەم تایبەتمەندیە ناسی.

## رووداوەکانیتر

لەم ساڵەدا حەبیب کوڕی موسلیمە هێرشی کردە سەر ئەو بەشە لەخاکی سوریا کەلەدەستی رۆمیەکاندا بو.

هەروەها لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ نایلە کچی فەرافصە پەیوەندی هاوسەری بەست. ئەم ژنەمەسیحی بو بەلام پێش ئەوەی عوسمان نزیکی بکات، باوەڕی بەئیسلام هێنا.

عوسمان لەم ساڵەدا بناغەی زەوراء ی دانا. لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

## روداوەکانی ساڵی بیست و نۆیەمی کۆچی (٦٥٠ زایینی)

### لابردنی ئەبو موسای ئەشعەری لەفەرمانداری بەسرە دانانی عەبدالله کوڕی عامر وەك فەرماندار

دەڵێن: لەم ساڵەدا عوسمان ئەبوموسای ئەشعەری لەسەر کارەکەی لابرد و عەبدالله کوڕی عامر کوڕی کورەیز کوڕی رەبیعە کوڕی عەبدشەمسی لەجێگەکەی ئەودانا. ئەم پیاوە کوڕی خاڵی عوسمان بو. دەستەیەك دەڵێن: ئەم کارە سێ ساڵ دوای خەلافەتی عوسمان بو.

هۆکاری لەسەر کارلابردنەکەی ئەوەبو کەخەڵکی ئیزەج و کوردەکان لەساڵی سێیەمی خەلافەتی عوسمان پشتیان کردە ئیسلام و ناباوەڕ بون. ئەبو موسا ئەم هەواڵەی لەناو خەڵکدا بلاّو کردەوە و ئەوانی بۆ شەڕ هاندا. خەڵك ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی پیادە بۆ شەڕ بڕۆن. ئەو پێشتر ئاماژەی بەکەسانێکدا بو کەشەڕی پیادە پەسەند دەکەن. لەبەر ئەمە دەستەیەك سوار بون و دەستەیەك پیادە بەرێکەوتن و سەرئەنجام هەمویان لەسەر پیادە شەڕکردن گەشتنە سازگاری. دەستەیەکی دیکە وتیان: پەلە ناکەین بەڵکو چاوەڕوان دەبین تا بزانین ئەو چی دەکات. ئەگەر وتارەکەی لەگەڵ کردارەکەی راست بێت، ئەو کارە دەکەین کەئەو ئەنجامیدا.

کاتێك هاتەدەر، باروبنەی خۆی سوار لەسەر چل ئێستر لەکۆشکەکەی هێنایەدەر. خەڵك جڵەوی ئەسپەکەی ئەویان گرت و وتیان: ئێمە سوار دەستەیەك لەم چوارپێیانە بکە و خۆت وەك ئێمە بەپیادە بڕۆ. ئەو بەقامچی لێیدان. خەڵك جڵەوی ئەسپەکەیان بەردا و درێژەی بەڕۆشتندا. خەڵك هاتنە لای عوسمان و داوای لەسەر کارلابردنی ئەویان کرد و وتیان: نەك ئەوەی هەمومان هەمو شتێك دەزانین، خوازیارین تۆ پرسیاری لێبکەیت. کەسێکی دیکە لەجیاتی ئەو بکەرە فەرمانداری ئێمە. وتی: کێ پەسەند دەکەن؟ وتیان: غەیلان کوڕی خەرەشە. هەر کەس دەتوانێت جێگرەوەی ئەم کۆیلەیە بێت کەسەرزەمینەکەی ئێمە سەراسەر بخوات. ئایا لەناو ئێوە هیچ کەسێکی پەست بونی نیە تا بتانەوێت پێگەکەی بەرز بکەنەوە؟ ئایا هیچ هەژارێك نیە تا بەسامانێکی بگەیێین؟

ئەی قورەیشیەکان، تا کەی ئەم پیرە کەمتیارەی ئەشعەری ئەم سەرزەمینە بخوات؟ عوسمان ئاگاداری کاروباری ئەو ناوچەیە بویەوە و ئەبو موسای لابرد و عەبدالله کوڕی عامری کورەیزی وەك فەرماندار دەست نیشان کرد. کاتێك ئەبو موسا ئەم هەواڵەی بیست، وتی: هەتیوێك دەبێتە فەرمانداری ئێوە کەبەردەوام بەم لاولادا هێرش دەکات و سەر بەهەر کونێکدا دەکات. ئەجدادی ئەو لەدایکەوە بەرێزن و دو سوپا دەکەونە ژێر فەرمانی ئەو. عەبدالله کوڕی عامر لەم کاتەدا( کەبو بەفەرمانداری بەشێك لەعێراق) بیست وپێنج ساڵ تەمەنی بو. ئەو فەرماندەیی سوپاکەی ئەبوموسای ئەشعەری و سوپاکەی عوسمان کوڕی ئەبی عاصی سەقەفی لەبەحرەین و عەممان بەدەست هێنا.

عوسمان لەخوراسان عومەیر کوڕی عوسمان کوڕی سەعدی دانا و لەسیستان عەبدالله کوڕی عومەیری لەیسی لەهۆزی سەعلەبە. ئەو هێرشی دەست پێکرد و تا کابول ڕۆشتە پێش. عومەیر کوڕی عوسمان پێشڕەوی کرد وخۆی گەیاند فەرغانە. هیچ شارێکی بەجێ نەهێشت مەگەر ئەوەی نۆژەنی کردەوە. عوبەیدالله کوڕی مەعمەری ڕەوانەی مەکران کرد و تا قەراغ روبارەکە ڕۆشتە پێش. عەبدولرەحمان کوڕی عوبەیسی بۆ کرمان ڕەوانە کرد و بۆ ئەهواز و فارس چەند کەسێکی دیکە. دواتر عەبدالله کوڕی عومەیری لابرد و عەبدالله کوڕی عامری بۆ یەك ساڵ لەجێگەکەی دانا و دواتر ئەویشی لابرد. هەروەها عاصم کوڕی عەمرۆی هێنایە سەرکار و عەبدولرەحمان کوڕی عوبەیسی لەسەر کارەکەی لابرد. عودەی کوڕی سوهەیل کوڕی عودەی گەڕاندەوە و عوبەیدالله کوڕی مەعەممەری هەڵگرت و ڕەوانەی فارسی کرد و لەجێگەکەی ئەو عومەیر کوڕی عوسمانی دانا. لەساڵی چوارەم، عیمران کوڕی فوزەیلی بەرجەمی وەك فەرمانداری سیستان ڕەوانە کرد. عاصم کوڕی عەمرۆ لەکرمان مرد.

## پەیمان شکێنی خەڵکی فارس

خەڵکی فارس شۆڕشیان کرد و پەیمانی خۆیان لەگەڵ عەبدالله کوڕی مەعمیر شکاند. عەبدالله روبەرویان بویەوە و هەردو سوپا لەدەروازەی ئیستەخر چاویان بەیەك کەوت. عەبدالله کوژرا و موسوڵمانان شکەستیان خوارد. ئەم هەواڵەیان بەعەبدالله کوڕی

عامردا. ئەو خەڵکی بەسرەی بۆ شەڕ هاندا و بەرەو فارس بەڕێکەوت. مەعقەل کوڕی یەسار فەرماندەی باڵی چەپ و ئەبو بەرەزەی ئەسلەمی فەرماندەی باڵی ڕاست و عیمران کوڕی حەصین فەرماندەی سوارەکانی لەئەستۆدابو. شەڕێکی قورس دەستپێکرد و ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و کوشتارێکی گەورە کەوتە ناو ئەوان و ئیستەخر بەزۆر شمشێر دەستی بەسەرداگیرا. ئەو ڕۆشتە دارابگەرد کەخەڵکەکەی پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو. دەستی بەسەردا گرت و بەرەو گور بەڕێکەوت کەهەمان ئەردەشێرە خەرەیە. خەڵکی ئیستەخر دوبارە پەیمانەکەی خۆیان شکاند. ئەو نەگەڕایەوە و پێشڕەوی بەرەو شاری گوری درێژە پێدا و گەمارۆی خستەسەر. هەرێم کوڕی حەیان پێشتر گەمارۆیدابو. موسوڵمانان زەمان لەدوای زەمان گەمارۆیان دەخستەسەر و دواتر بڵاوەیان لێدەکرد و دەگەڕانەوە بۆ ئیستەخر و شەڕیان دەکرد و ئەو ناوچانەیان سەرکەوت دەکرد کەشۆڕشیان دەستپێکردبو. کاتێك کوڕی عامر دابەزی، دەستی بەسەرداگرت.

هۆکاری گرتنەکەی ئەوەبو کەیەکێك لەموسوڵمانان شەوێك نوێژی دەکرد و هەمانەیەکی لەتەنیشتەوە بو کە نان و گۆشتی تیا دانرابو. سەگێك هات و هەڵیگرت ورایکرد و لەرێگەیەکی نهێنینەوە ڕۆشتە ناو شارەکە. موسوڵمانان بەو ڕێڕەو ژێرزەمینیەدا تا ناو شارِ ڕۆشتن و بەزۆری شمشێر دەستیان بەسەرداگرت.

کاتێك عەبدالله کوڕی عامر لەو کارە تەواوبو، بۆ ئیستەخر گەڕایەوە و گەمارۆی خستەسەر و شەڕێکی قورسی لەو شارە هەڵگیرساند و سەرئەنجام بەزۆر دەستی بەسەرداگرت. بۆ گرتنی شارەکە کەشکەنجیریان دانا و دەستەیەکی فراوان لەئێرانیەکانیان کوشتار کرد و کەسانی بنەماڵە گەورەکان و سەرکردەی ئەسوارەکان لە ناوبرد کەپەنایان بۆ ئەو شارە هێنابو و بەمشێوەیە توانیان دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرن. دەستەیەك دەڵێن: کاتێك خەڵکی ئیستەخر پەیمان شکێنیان کرد، عەبدالله کوڕی عامر پێش گەیشتن بەشاری گور، گەڕایەوە و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و دواتر بۆ گور گەڕایەوە و لەوێوە بۆ دارابگەرد و ئەو شارەیشی بەزۆر گرت کەخەڵکەکەی پەیمان شکێنیان کردبو. بەشێوەیەك خەڵکی فارسی سەرکوت کرد کەبەردەوام لەزیانەکەی بەریسوایی دەژیان. ئەم هەواڵانەی بۆ عوسمان ڕەوانە کرد. عوسمان بۆی نوسی کەهەرێم کوڕی حەییانی یەشکری و هەرێم کوڕی حەییانی عەبدی و خێریەت کوڕی

راشد و منجاب کوڕی راشد و تەرجومانی هوجەیمی لەسەرزەمینەکانی فارس بکاتە فەرمانڕەوا. ئەو فەرمانیدا کەشارەکانی خوراسان لەناو دەستەیەکدا دابەش بکات: ئەحنەف بکاتە فەرمانداری دومەرو، حەبیب کوڕی قەرەی یەربوعی بکاتە فەرمانداری بەلخ، خالد کوڕی عەبداللە کوڕی زوهەیر لەهەرات، ئەمیر کوڕی ئەحمەر لەتوس و قەیس کوڕی هوبەیرەی سەلی لەنەیشابور بکاتە فەرماندار. لەم شارەدا بو کەعەبداللە کوڕی خازم گەورە و گەشەی سەند. دواتر عوسمان پێش مەرگی خۆی هەمویان خستە ژێر فەرمانی قەیس کوڕی هوبەیرە و ئەمیر کوڕی ئەحمەری کردە فەرمانداری سیستان. دواتر عەبداللە کوڕی سەمورەی کردە فەرماندار. ئەو لەبنەماڵەی حەبیب کوڕی عەبدشەمس (لەخزمەکانی عوسمان)بو. کاتێك عوسمان مرد، ئەو فەرمانداری ئەم شارە بو. ئەو مرد و عیمران لەمەکران، عومەیر کوڕی عوسمان کوڕی سەعد لەپارس و ئیبنی کێندیری قوشیری فەرمانڕەوایی کرمانی دەکرد.

دواتر قەیس کوڕی هوبەیرە، عەبداللە کوڕی خازمی لەرۆژگاری عوسمان بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای عەبداللە کوڕی عامر رەوانە کرد. عەبداللە کوڕی عامر رێزی لێگرت. بەکوڕی عامری وت: فەرمانێك بۆ من بنوسە کەتیایدا قەیس کوڕی هوبەیرە لەخوراسان برواتەدەر و من ببمە فەرمانداری ئەوێ. ئەم کارەی کرد. ئەو بۆ خوراسان گەڕایەوە. کاتێك عوسمان کوژرا و دوژمن راپەڕی، کوڕی خازم بەقەیسی وت: باشترە من بکەیتە جێگری خۆت و بەرێکەویت و ئەوەی کەسانێتر دەیبینن، ببینیت. ئەم کارەی کرد. کوڕی خازم فەرمانی جێگری خۆی دەرهێنا و لەخوراسان مایەوە تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالب هاتەسەر کار. قەیس کوڕی هوبەیرە لەکرداری کوڕی خازم توڕە بو.

## دروست کردنی فراوانی لەمزگەوتی پێغەمبەر(ص)

لەمانگی رەبیع الاولی ئەم ساڵە /نۆڤەمبەری ٦٤٩ زایینی عوسمان مزگەوتی پێغەمبەر(ص)ی فراوان کرد. گەچی لەخوراسانەوە هێنا. بەبەرد رەنگینیان کرد و ستونەکانیان بەبەرد و مس حەوادا. درێژیەکەیان کردە سەد و شەست گەز و پانایییەکەی سەد و پەنجا گەز. لەرۆژگاری عومەر شەش دەرگایان بۆ دروست کرد.

## نوێژخوێندنی تەواوی عوسمان لەگەڵ خەڵکو یەکەم ڕەخنەکان کەخەڵك لەویان گرت

لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد و لەمەنی سەراپەردەیەکی بۆ خۆی دروست کرد. ئەمە یەکەم سەراپەردەبو عوسمان دروستی کرد. ئەو لەم جێگە و لەعەرەفە نوێژی جەماعەتی خوێند. بۆ یەکەم جار خەڵك بەتوندی و ڕاشکاو سەبارەت بەعوسمان قسەیان کرد چونکە ئەو نوێژەکەی خۆی لەمەنی بەتەواوی خوێند. زۆر لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەیان کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالب پێی وت: نەکارێکی تازە هاتۆتە پێش و نە ئێمە لەڕۆژگاری ئیسلام و سەردەمی پێغەمبەر(ص) دورکەوتوینەتەوە. تۆ خۆت بینیت کەپێغەمبەر(ص) و ئەبوبەکر و عومەر لێرە دو ڕەکعەت نوێژیان خوێند و تۆ لەسەرەتایی خەلافەتی خۆتدایت. نازانم کاری تۆ دەگاتە کوێ. عوسمان وتی: بۆچونێکە هەڵمبژاردوە. ئەم هەواڵە بەعەبدولڕەحمان کوڕی عەوف گەیشت. هاتە لای عوسمان وپێی وت: ئایا تۆ لێرە لەگەڵ پێغەمبەر(ص) و ئەبوبەکر و عومەر نوێژت نەخوێند، ئەوان دو ڕەکعەتیان خوێند و تۆیش دو ڕەکعەت؟ عوسمان وتی: بەڵێ، بەڵام بیستومە دەستەیەك لەحاجیەکانی یەمەن و دەستەیەك خەڵکی ژێر دەستە وتویانە نوێژ بۆ ئەوانەی دەمێننەوە، دو ڕەکعەتە. ئەوان وەك نوێژەکەی من دەخوێنن. من لەمەککە هاوسەرێکم هەیە و لەتایف سامانەکەم. عەبدولڕەحمان وتی: ئەم بیانوە ڕاست نیە. بەڵام ئەوەی دەڵێی لێرە هاوسەرێکم گرتوە، هاوسەرەکەی تۆ لەوێ لەمەدینە دێتەدەر و لەهەر شوێنێك بمێنیتەوە، دەمێنێتەوە. بەڵام سامانەکەی تۆ لەتایف، بیانوێکی ناڕاستە چونکە لەوێ تا ئێرە سێ شەو و ڕۆژ ڕێگەیە و وتارەکەت سەبارەت بەحاجیەکانی یەمەن و کەسانیتر، زێدەڕۆییەك زیاتر نیە. لێرە وەحی بۆ پێغەمبەر(ص) دابەزی و ئیسلام لاواز و کەم پشتیوان بو. دواتر ئەبوبەکر و عومەر هاتن و هەمویان دو ڕەکعەت نوێژیان خوێند. ئێستا ئیسلام بەهێز بوە و جێگەی ئەم کایانە نیە. عوسمان وتی: بۆچونێکە هەڵمبژاردوە.

عەبدولڕەحمان بەجێیهێشت و عەبداللە کوڕی مەسعودی بینی وپێی وت: ئەبو

محەممەد، ئەوەی دەیبینی، بیگۆڕە. وتی: چی بکەم؟ وتی: ئەوەی دەیزانی و دەیبینی، ئەنجامی بدە. کوڕی مەسعود وتی: ناسازگاری زیانی لێدەکەوێتەوە. من لەگەڵ هاورێکانم چوار رەکعەتم خوێند. عەبدولرەحمان وتی: من و هاورێکانم دو رەکعەتمان خوێند بەلاَم ئێستا چوار رەکعەت دەخوێنم.

دەستەیەك دەڵێن: ئەمە لەساڵی٣٠/٦٥١ زایینی رویدا.

# روداوەکانی ساڵی سی کۆچی (٦٥١ زایینی)

## لابردنی وەلید لەکوفە و دانانی سەعید

عوسمان لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عەقەبەی لەفەرمانڕەوایی کوفە لابرد و سەعید کوڕی عاصی لەجێگەکەی دانا. هۆکاری فەرماندار بونی وەلید لەکوفە، لەروداوەکانی دوەم ساڵی خەلافەتی عوسمان ئاماژەی پێدرا و نوسراو هات کە ئەو لای خەڵك زۆر خۆشەویستتربو. سێ ساڵ بەمشێوە بو و ماڵەکەی دەرگای نەبو. دواتر چەندین گەنج لەخەڵکی کوفە کەلێنێکیان لەماڵەکەی عەلی کوڕی حیسمانی خوزاعی دروست کرد و سامانەکەیان بەزۆر زانی و مەبەستی ئەوەیان کرد تالأنی بکەن. ئەو لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار بویەوە و بەشمێر هاتەبەردەرگا و هاواری کرد. شورەیحی خوزاعی کەبۆ نزیك کەوتنەوە لەسەرزەمینی شەڕ لەمەدینە بۆ کوفە کۆچی کردبو، لەسەرەوە هات بەڵام ئەوان سەیریان نەکرد و کوڕی حەیسمانیان کوشت. خەڵك ئەوانیان گرت کەئەمانە بون: زوهەیر کوڕی جەندەبی ئەزدی، موەرەع کوڕی ئەبی موەرەعی ئەسەدی، شوبەیل کوڕی ئوبی ئەزدی و کەسانیتر. شورەیح و کوڕەکەی بۆ ئەم روداوە شایەتیان دا. وەلید هەواڵی ئەم کارەی بۆ عوسمان نوسی. عوسمان نامەی بۆ نوسی وفەرمانیدا ئەوان بکوژن. وەلید ئەوانی لەبەردەرگای کۆشکدا کوشت. بەم پێیە، بەپێی وتەی سەرپەرەستی بنەماڵەی کوژراو لەرێ و رەسمی (سوێند خۆرەکان) هەڵس و کەوتیان کرد و ئەوانیان بەئاشکرا لەبەرچاوی خەڵکدا کوشت تا خەڵك لەکوشتنی یەکتر خۆبپارێزن.

ئەبو زوبەیدی وتاردەر لەرۆژگاری جاهلی و ئیسلام لەناو بەنی تەغلەب دەژیا. ئەمان خاڵەکانی ئەوبون. ئەوان لەدانی قەرزەکەی ستەمیان لێکرد و وەلید مافەکەی بۆ وەرگرتەوە چونکە کارگوزاری ئەوان بو. ئەبو زوبەید لەم کارە سوپاسی کرد و لەمەدینە و کوفە بەردەوام لەگەڵ ئەودابو. ئەو پیاوێکی مەسیحی بو کەلای وەلید باوەڕی بەئیسلام هێنا و رێزی لەئایینە تازەکەی خۆی گرت. رۆژێك کەئەبو زوبەید لای وەلید دانیشتبو، کەسێك هاتە لای باوکی زێنەب و باوکی موەرەع و باوکی زوهەیر (جەندەب) و بەوانی وت کەوەلید و ئەبو زەینەب شەراب دەخۆنەوە. ئەوان کەلێنیان لەماڵەکەی وەلید دروست کرد و بەردەوام چاودێریان دەکرد تا بیگرن و بیکوژن چونکە کوڕەکانی

ئەوانی کوشتبو. ئەوان شۆڕشیان کرد و چەند کەسێکیان لەخەڵکی کوفە گرت و لەناکاو رویان کردە ماڵەکەی ئەو، بەڵام هیچیان نەبینی. گەڕانەوە و بەردەوام سەرکۆنەی یەکیان دەکرد و خەڵك جوێنی پێدەدان. وەلید ئەمەی لەعوسمان شاردەوە.

جەندەب و چەند کەسێك هاورێ لەگەڵ ئەو رۆشتنە لای باوکی مەسعود و پێیان وت: وەلید بەردەوام شەراب دەخوات. باوکی مەسعود وتی: هەر کەس خۆی لەنێمە داپۆشێت، پەردەکەی هەڵناماڵین. وەلید بۆ ئەم وتەیە سەرکۆنەی کرد بەشێوەیەك ئەم دوانە رِقی یەکیان لەدڵ گرت. دواتر جادوگەرێکیان بۆ لای وەلید هێنا و ئەو کەسی بەدوای باوکی مەسعوددا نارد و پرسی دەبێت چ سزایەکی بدات. جادوگەر لای باوکی مەسعود دانی بەگوناحەکی خۆیدانا. ئەو لەبەر چاوی خەڵك وای نیشان دەدا کەدەڕواتە ناو قونی کەر و لەدەمییەوە دێتەدەر. باوکی مەسعود فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. کاتێك وەلید ویستی بیکوژێت، خەڵك لەگەڵ جەندەب کۆبونەوە و ئەو لەجادوگەریدا و کوشتی. وەلید ئەوی خستە زیندان و سەبارەت بەم کارە نامەی بۆ عوسمان نوسی. عوسمان فەرمانی پێدا تا تەمێی بکات و دواتر ئازادی کات. هاورێکانی جەندەب لەبەرژەوەندی ئەو شۆڕشیان کرد و ڕۆشتنە لای عوسمان و داوای لەسەر کار لابردنی وەلیدیان کرد. عوسمان ئەوانی بێ هیوا گەڕاندەوە. کاتێك گەڕانەوە، هەمو داغ دیتوەکان لەدەوری ئەوان کۆبونەوە و لەگەڵ ئەوان یەکیان گرت. باوکێ زێنەب و باوکی مومرەع و کەسانی دیکە هاتنە لای وەلید و گفتوگۆیان لەگەڵ کرد. ئەو خەوت و ئەم دوانە مۆرەکەی ئەویان هەڵگرت و بۆ مەدینە ڕۆشتن. وەلید هەستا و بینی ئەنگوستیلەکەیان فڕاندوە. لەهاوسەرەکانی پرسیاری کرد کەوتیان: دوایین کەسەکان کەلای تۆ مانەوە دوپیاو بون و تایبەتمەندیەکانیان بەمشێوەبو. ئەو دوانەی بەگوناحکار زانی و وتی باوکێ زێنەب و مومرەعن. چەندین کەسی نارد تا ئەو دوانە دەستگیر بکەن بەڵام نەیاندۆزینەوە.

ئەم دوانە هاورێ لەگەڵ کەسانیتر ڕۆشتنە لای عوسمان و پێیان وت کەوەلید شەراب دەخوات. عوسمان کەسی بەدوای وەلیددا نارد. ئەو بۆ مەدینە ڕۆشت. عوسمان ئەو دوانەی بانگ کرد و پرسی: ئایا شایەتی دەدەن کەبینیوتانە ئەو شەرابی خواردوە؟ وتیان: نە. وتی: ئەی چۆن؟ وتیان: پاشماوەکەیمان لەریشی وەرگرت کەهێنابویەوە.

عوسمان فەرمانی بەسەعید کوڕی عاصدا کەقامچی بارانی کرد. ئەم کارە لەناو بنەماڵەکانی ئەم دوانە رق و کینەی دروست کرد. کاتێك دەیانویست بەقامچی لەوەلید بدەن، کراسێکی لەبەردابو کەعەلی کوڕی ئەبی تالب وتی دایکەنن.

لەم گێڕانەوەیە بەمشێوەیە هاتوە. راستیەکەی ئەوەیە ئەو کەسەی بەقامچی لەوەلیدی دا، عەبداللە کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب بو چونکە کاتێك عەلی فەرمانی بەحەسەنی کوڕی دا ئەو کارە ئەنجام بدات، حەسەن وتی: رەنجەکەی بۆ ئەو کەسەی گەنجەکەی دەبات! عەلی فەرمانی بەعەبداللە کوڕی جەعفەردا کەچل قامچی لەوەلید دا. عەلی وتی: دەست راگرە، پێغەمبەر(ص) چل قامچی لێدا، ئەبوبەکر چل قامچی و عوسمان هەشتا جار. هەمویان شێوازێکی پەسندن بەلآم من ئەمەیانم لای خۆشەویستترە.

دەستەیەك دەڵێن: وەلید کوڕی عەقەبە مەستی کرد و نوێژی جەماعەتی بەیانی بەچوار رەکعەت لەگەڵ خەڵکی کوفەدا خوێند و لەکۆتاییدا روی کردە ئەوان و وتی: دەتانەوێت زیاترتان بۆ بخوێنم؟ عەبداللە کوڕی مەسعود وتی: ئەمڕۆ بەردەوام گوشاری زۆرت خستە سەر ئێمە! ئەمان لای عوسمان لەزیانی ئەو شایەتیان دا. عوسمان فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەبی تالبدا بەقامچی لێی بدات. عەلیش فەرمانی بەعەبداللە کوڕی جەعفەردا و قامچییان لێدا. حوتەیئە لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| شهد الحطيئة يوم يلقي ربه | ان الوليد احق با لغدر |
| نادى و قد تمت صلاتهم: | أ ازيدكم؟ سكرا و ما يدرى |
| فابوا ابا وهب و لو اذنوا | لقرنت بين الشفع و الوتر |
| كفوا عنانك اذ جريت ولو | تركوا عنانك لم تزل تجرى |

یانی:

ئەو رۆژەی حوتەیئە دەڕواتە بینینی خواکەی خۆی، شایەتی دەدات کەوەلید بۆ پەیمان شکێنی شیاوترە. چونکە کاتێك نوێژەکەی خۆی کۆتایی پێ هێنا، لەروی نەزانی و مەستیەوە وتی: دەتانەوێت نوێژی زیاترتان بۆ بخوێنم؟ ئەی ئەبو وەهەب، چەندە باش بو خەڵك رازی نەبون چونکە ئەگەر رازی دەبون، نوێژی تاك و جوتت پێکەوە دەخوێند. کاتێك بەغاردان ڕۆشتی، لغاوی تۆیان گرت و ئەگەر بەرەلآیان دەکردی،

بەهەمان شێوە بەغاردان دەڕۆشتیت.

کاتێك عوسمان لەشەراب خواردنەوەی وەلید ئاگادار بویەوە، ئەوی لەسەر کار لابرد و سەعید کوڕی عاص کوڕی ئومەییە کردە فەرماندار. سەعد لەداوێنی عومەر کوڕی خەتاب گەورە کرابو. کاتێك عومەر دەستی بەسەر شامدا گرت، سەعید هاتە ئەم سەرزەمینە و لەگەڵ معاویە مایەوە. ڕۆژێك عومەر قوڕەیشیەکانی بیر هێنایەوە و پرسیاری ئەوی کرد. وتیان: لەشامە. ئەو سەعیدی بانگ کرد و پێی وت: بیستومە کەپیاوێکی چاکەکار و ڕاست کرداریت. چاکیەکانی خۆت زیاتر بکە تا خوا بەخشینەکانی بەتۆ ببەخشێت. پێی وت: هاوسەرت هەیە؟ سەعید وتی: نە. دوای ماوەیەك کچەکانی سوفیان کوڕی عومیف هاوڕێ لەگەڵ دایکیان هاتنە لای عومەر. دایك وتی: پیاوەکانی ئێمە لەناوچون و کاتێك پیاوەکان نەمێنن، ژنەکان بەفیڕۆ دەچن. ئەوان بدە ببەخشە بە پیاوانە تا ببنە هاوسەریان. عومەر یەکێك لەکچەکانی لەسەعید مارە کرد و یەکیتریانی لەعەبدولرەحمان کوڕی عەوف. دوبارە کچەکانی نوعەیمی نەهشلی هاتنە لای و وتیان: پیاوەکانمان لەناوچون و منالەکان ماونەتەوە. ئێمە بەهاوتاکانی خۆمان بەشو بدە. عومەر یەکێك لەکچەکانی کردە هاوسەری سەعید و یەکیتریان بەجوبەیر کوڕی موتعیم. مامەکانی ئەو پێشینەیەکی ڕاستیان لەئیسلامدا بو. هێشتا عومەر نەمردبو سەعید بو بەیەکێك لەپیاوە ناودارەکانی قوڕەیش. کاتێك عوسمان وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشانی کرد، بەڕێکەوت و وەك فەرماندار ڕۆشتە ناو ئەو شارە. ئەشتەر و ئەبوخەشەی غەفاری و جەندەب کوڕی عەبدالله و جوسامە کوڕی سەعب هاوڕێ لەگەڵ ئەو گەڕانەوە. ئەوان لەگەڵ وەلید بۆ کوفە هاتبون تا هاوکاری بکەن بەلام بون بەدوژمنی. یەکێك لەشاعیرەکانی کوفە وتی:

| | |
|---|---|
| فررت من الوليد الى سعيد | كاهل الحجر اذ جز عوافبارو |
| يلينا من قريش كل عام | امير محدث او مستشار |
| لنا نار نخوفها فنخشى | و ليس لهم فلا يخشون نار |

یانی: لەوەلید بۆ سەعید هەڵاتین و ئەمە هاوشێوەی خەڵکانی حجر بو کەبێ ئۆقرەییان دەکرد و لەناوچون. هەر ساڵ لەقوڕەیشیەکان فەرمانداریك بۆ ئێمە دەگات، یا کەم

تەمەن یا پیر. ئێمە ئاگرێکمان هەیە کەئێمەی پێ دەترسێنن و دەترسین. ئەوان نەئاگریان هەیە نەترس.

کاتێك سەعید گەشتە کوفە، ڕۆشتە سەر کورسی وتاردان و سوپاس و وەسفی خوای کرد و وتی: سوێند بەخوا کاتێ منیان بەرەو لای ئێوە رەوانە کرد، فەرمانڕەوایی کردن بەسەر ئێوەم لای ناخۆش بو بەلاّم چونکە فەرمانیاندا، رێگە چارەم نەبو. ئاژاوە و شۆڕش لوت و دوچاوی خۆی ئاشکرا کردوە. سوێند بەخوا بەشێوەیەك لەروخساری دەدەم تا سەرکوتی بکەم یا بێزار و شەکەتم دەکات. من لەمڕۆوە بەرەو پێش دەڕۆم.

دواتر هاتەخوار و سەبارت بەخەڵکی کوفە پرسیاری کرد و لەرۆژگار و چۆنیەتی ژیانی ئەوان ئاگادار بویەوە. دواتر نامەی بۆ عوسمان نوسی کە کاروباری خەڵکی کوفە روی لەپەرێشانیە و گەورەکان و بنەماڵە ناودارەکان و کەڵك وەرگران لەپێشینە درەوشاوەکان سەرکوت کراون ولەکاری خۆیاندا ماونەتەوە. ئەوانەی فەرمانڕەوایی ئەم شارە دەکەن، پاشماوەی ئەو کەسانەن، درەنگتر بۆ ئێرە هاتون و خەڵکانی بیابانن کەپەیوەستی ئێرە بون. کار گەشتۆتە ئەو شوێنەی لەگەورەکان و رەنج دیتوان پرسیار ناکرێت کەرۆژگارتان چۆنە و بەچ کارێکەوە گرفتارن.

عوسمان بۆی نوسی: خاوەن ئەزمونە باشەکان و پێشینە درەوشاوەکان پێش بخە کەخواوەند ئەو سەرزەمینی لەسەردەستی ئەوان گرتوە، پێش بخە. دەبێت ئەو کەسانەی درەنگتر هاتون و گەشتونەتە لای ئەمان، شوێنکەوتەی ئەوان بن مەگەر ئەوەی خۆیان لەڕۆشتن بەرەو راستی و دروستی لاوازی بکەن و بەو کارە هەڵنەستن و لەم رێگەوە کار دەکەوێتە دەست ژێردەستەکان. پێگە و جێگەی هەر کەسێك رابگرە و بەهەموی ئەوان بەشی پێویست بەوان ببەخشە چونکە تەنیا لەرێگەی ناسینی خەڵکەوەیە دەتوانیت دادپەروەری بەدیبێنیت.

سەعید چەندین کەسی بەدوای شەڕکەرانی رۆژە سەختەکانی شەڕی قادسیە نارد و پێی وتن: ئێوە روخسارە درەوشاوەکانی خەڵکن. لەروخسارەوەیە دەتوانرێت چۆنیەتی جەستەی خەڵك بناسرێتەوە. ئێستا نیازی نیازمەندان بەمن بڵێن. پاشماوەکان و ئەوکەسانەی درەنگتر هاتبون ولایەنگری راستی و دروستی بون، پەیوەستی ئەم دەستەی کردن و خوێنەرە هەمیشەییەکانی قورئانی کردە هاونشینی شەوانەی خۆی. ئاژاوە و

دەمەقاڵە لەناو خەڵکی کوفەر بەرز بویەوە. سەعید ئەم پێشهاتەی بۆ عوسمان نوسی. عوسمان خەڵکی کۆکردەوە و لەوەی بۆی نوسرابو، ئاگاداری کردنەوە، پێیان وت: کارێکی باشت کرد، ئەوان بەوەی شیاو نین پێی، هیوادار مەکە چونکە ئەگەر ئەو کەسانەی شیاو نین  کاروبارەکان راپەڕێنن، بەرگەی ناگرن و بەفیڕۆیی دەبەن. عوسمان وتی: ئەی خەڵکی مەدینە ئامادەبن و خۆتان بەهێز بکەن چونکە ئاژاوە روی لەئێوە کردوە. سوێند بەخو بێ چەند و چون ئەوەی هەتانە تایبەتی دەکەم بەئێوە تا ئەگەر بتانەوێت، بیهێنمە لای ئێوە تا بەشی هەمو ئەو کەسانەی هاورێ لەگەڵ عێراقیەکان لەشەڕەکاندا هەوڵیان داوە و شەڕیان کردوە، بگات بەدەستیان. وتیان: چۆن بەشی ئێمە لەزەویەکان بۆ ئێرە دێنیت؟ وتی: هەر کەس دەخوازێت لەبەرابەر ئەوەی لەحجاز و یەمەن و شارەکانی تر هەیەتی، بفرۆشێت. ئەوان شادمان بون و بۆ ئەم کارە سوپاسی خوایان کرد. ئەو کارەیان کرد و پیاوەکان لەهۆزە جۆراوجۆرەکان ئەوانەیان کڕیەوە و عوسمان بەرەزامەندی ئەوان و شایەتی خەڵکان وریز گرتن لەمافی کەسانیتر ئەو ئاڵوگۆڕەی پشت راست کردەوە.

## هێرشی سەعید کوڕی عاص بۆ تەبەرستان

لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عاص ئاهەنگی تەبەرستان و گرتنی ئەو سەرزەمینەی کرد چونکە تا ئەم ساڵە کەس لەوێ شەڕی نەکردبو. ناسازگاری مێژوونوسان لەمبارەوە لەباس کردنی روداوەکانی خەلافەتی عومەر ئامازەی پێدرا. وترا کەئیسپەهبۆدی تەبەرستان لەسەر بنەمای دانی ئەندازەیەك لەسامان لەگەڵ سوەید کوڕی موقەرن پەیمانی ئاشتی بەست. بەڵام بەپێی ئەم وتارە، سەعید لەساڵی٣٠/٦٥١ زایینی ئاهەنگی ئەو ناوچەی کرد و حەسەن و حسێن و عەبداللە کوڕی عەباس و عەبداللە کوڕی عومەر و عەبداللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاص و عەبداللە کوڕی زوبەیر و حوزەیفە کوڕی یەمان و خەڵکانێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) هاورێیەتی ئەویان دەکرد. عەبداللە کوڕی عامر بەمەبەستی خوراسان لەبەسرە رۆشتەدەر و پێش سەعید کەوتەوە و لەنەیشابور دابەزی. حوزەیفە دوای نەهاوەند لەگەڵ خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی بەستبو. سەعید هاتە گورگان کەخەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی دوسەد هەزار دینار

ئاشتیان لەگەڵ کرد. دواتر ڕۆشتە تەمیسە. ئەمانە هەموویان لەشارەکانی تەبەرستان لەسنوری گورگان و لەقەراغ دەریا جێگیر بون. خەڵکەکەی لەبەرابەر ئەو خۆڕاگریان کرد. ئەو نوێژی ترسی خوێند کەحوزەیفە فێری کرد. ئەمە لەگەرماوگەرمی شەڕەکەدا بو. لەم شەڕەدا سەعید شمشێری لەملی پیاوێکدا بەشێوەیەك لەژێر باڵیەوە هاتەدەر. گەمارۆی خستە سەر ئەوان و داوای ئەمانیان کرد. لەسەر ئەم بنەمایە ئەمانی پێدان کەیەك پیاو نەکوژێت. دەروازەکانیان کردەوە و سەعید هەموویانی کوشتار کرد. تەنیا یەك پیاوی بەزیندویی هێشتەوە. هەرچی لەناو قەڵاکەدابو، تاڵانی کرد. پیاوێك لەبەنی نەهد سەوەتەیەکی دۆزیەوە کەقوفڵی لێدرابو. گومانی کرد گەوهەری تیایە. ئەم هەواڵە بەسەعید گەیشت و ئەو کەسێکی بەدوای پیاوی نەهدیدا ڕەوانە کرد کەسەوەتەکەیان هێنایە لای ئەو. قوفڵەکەیان شکاند و سەوەتەیەکی دیکەیان تیا بینی. کردیانەوە و پارچەیەکی سوریان تیا بینی. پارچەسورەکەیان کردەوە و بینیان پارچەیەکی زەردە. پارچە زەردەکەیان کردەوە و بینیان دوکێر و بڕێك شەراب و مشتێك خۆڵە. یەکێك لەشاعیرەکان بۆ سەرکۆنە کردنی نەهدیەکان وتی:

آب الکرام بالسبایا غنیمة و آب بنو نهد بایرین فی سفط

کمیت و ورد وافرین کلاهما فطنوهما غنما فناهیك من غلط

یانی: گەورەکان، ژنە جوان روخسارەکانیان گرفتار کرد و دەیانهێنا و نەهدیەکان بەدوکێر کەلەناو سەوەتەیەکدا بو، هاتن، شەراب و مشتێك خۆڵ، هەردوکیان پێشکەش بێت. گومانیان برد گەنجیان دۆزیوەتەوە. چ گومانێکی هەڵەیان کرد.

سەعید دەستی بەسەر نامیەدا گرت کەشار نەبو بەڵکو پانتاییەکی بەربڵاوتر لەبیابانەکان بو.

هاوڕێ لەگەڵ سەعید، محەممەد کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی عەقیل باوەگەوڕێی یوسف کوڕی عومەر مرد. دواتر سەعید گەڕایەوە.

کەعب کوڕی جوعەیل وەسفی کرد و وتی:

فنعم الفتی اذخال جیلان دونه و اذ هبطوا من دستبی ثم ابهرا

یانی: چەندە جوامێری ئازا بو کە لەگیلان ڕێگەی مەرگی لەو بەست.

ئەمە قەسیدەیەکی گەورەیە.

کەسەعید لەگەڵ خەڵکی گورگان پەیمانی ئاشتی بەست، هەندێ کات سەد هەزاریان دەدا و هەندێ کات دوسەد هەزار و هەندێ کات سێسەد هەزار. دەیانوت: ئەمە ئەو بڕەیە پەیمانی ئاشتیمان لەسەر بەستوە. دواتر لەقەلاَکاندا خۆیان حەشاردا و لەدین هەڵگەڕانەوە. ڕێگەی خوراسان لەقومسەوە پچڕا و تێپەڕین لەو ڕێگایە تەنیا مەترسی فراوانی ئەوانی لەسەر بو. ڕێگەی خوراسان لەپارس تا کرمان تا خوراسان بو. یەکەم کەس لەڕێگەی قومسەوە ڕۆیشت، قەتیبە کوڕی موسلیم لەکاتی فەرمانڕەوایی کردنی بەسەر خوراساندا بو. یەزد کوڕی موهەلیب لەوێ دابەزی و پەیمانی ئاشتی بەست و دەستی بەسەر دێ و دەریاچەدا گرت و لەگەڵ خەڵکی گورگان لەسەر بنەمای ئاشتی سەعید ئاشتی کرد.

## ڕۆشتنی حوزەیفیە بۆ شەڕ لەباب

کۆکردنەوەی قورئان لەم ساڵەدا حوزەیفەیان لەشەڕی ڕەی دور خستەوە و ناردیان بۆ هاوکاری کردنی عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە لەشەڕی (باب). سەعید کوڕی عاص لەگەڵی هاتەدەر و هاورێ لەگەڵ ئەو گەیشتە ئازەربایەجان. لەخەڵك وەك پشتیوان کەڵکیان وەردەگرت. ئەو مایەوە تا حوزەیفە گەڕایەوە و دواتر هەردوك گەڕانەوە. کاتێك حوزەیفە گەڕایەوە بەسەعید کوڕی عاصی وت: لەم سەفەرەدا شتی زۆرم بینی، ئەگەر ڕێگە بەخەڵك بدرێت، لەنوسین و خوێندنەوەی قورئان بەشێوەی جیاواز کەڵك وەردەگرن کەهیچ کات دواتر لەسەری کۆك نابن. وتی: چیت بینی؟ وتی: کەسانێکم لەحمص بینی گومانیان دەکرد شێوەی خوێندنەوەی ئەوان باشترە چونکە قورئان لەمیقدادەوە فێر بون. کەسانێکم لەخەڵکانی دەمشق بینی، دەیانوت: چۆنیەتی قورئان خوێندنی ئێمە باشترە لەکەسانیتر. خەڵکانی کوفەیش بەمشێوەیە دەڵێن چونکە قورئان لای عەبدالله کوڕی مەسعود فێربون. خەڵکی بەسرەیش بەمشێوە دەڵێن لەبەر ئەوەی قورئان لەسەردەستی ئەبوموسای ئەشعەری فێر بون. ئەوان قورئانەکەی خۆیان بە(هەڵبژێردراوی دڵەکان) ناو دەبەن. کاتێك گەشتنە کوفە، حوزەیفە خەڵکی لەوەی بینیبوی، ئاگادار کردەوە و لەوەی لێی دەترسان، هۆشداری پێدان. هاوەڵانی

پێغەمبەر(ص) و چەندین کەس لە(شوێنکەوتوان) لەگەڵی هاودەنگ بون.
هاورێیانی عەبدالله کوڕی مەسعود پێیان وت: چ شتێك بەهۆی کەم و کوڕی ئێمە دەزانیت؟ مەگەر نەئەوەیە ئێمە وەك عەبدالله کوڕی مەسعود قورئان دەخوێنین؟
حوزەیفە و هاورێکانی توڕە بون و وتیان: ئێوەدەستەیەکی بیابان نشینن، بێدەنگ بن چونکە بەرێگای ناڕاستدا دەڕۆن. حوزەیفە وتی: سوێند بەخوا ئەگەر زیندو بمێنم، دەڕۆمە لای سەروەری باوەڕداران و داوای لێدەکەم رێگەی هەڵە لەم کارەدا ببەستێت.
عەبدالله کوڕی مەسعود بەتوندی قسەی لەگەڵ کرد. سەعید توڕە بو، هەستا و خەڵك بڵاوەیان لێکرد. حوزەیفە توڕە، بەرەو لای عوسمان بەرێکەوت و ئەوی لەپێشهاتەکان ئاگادار کردەوە و وتی: من ئاگادارکەرەوەیەکی ئاشکرام، پەلە بکەن و فریایی خەڵك بکەون. عوسمان هاورێکانی پێغەمبەر(ص)ی کۆکردەوە و لەم بابەتە ئاگاداری کردنەوە. ئەم روداوەیان بەگەورە زانی و لەگەڵ حوزەیفە هاودەنگ بون.
عوسمان کەسێکی بەدوای حەفصە کچی عومەری خەتاب نارد و وتی: قورئانەکان بۆ لای ئێمە بنێرە تالەبەری بنوسینەوە. ئەمانە، ئەو قورئانانە بون لەسەردەمی ئەبوبەکر کۆکرابونەوە. بەمشێوە بو کاتێك لەشەڕی یەمامە زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ص) کوژران، عومەر بەئەبوبەکری وت: لەشەڕی یەمامە زۆر لەخوێنەرانی قوران کوژران. دەترسم مەرگ و کوشتار باڵ بەسەر ژیانی خوێنەرانی قورئاندا بکێشێت و نوسراوی خوامان لەبیر بچێتەوە. پێم باشە فەرمانی کۆکردنەوەی قورئان بدەیت. ئەبوبەکر فەرمانی بەزەید کوڕی سابتدا تا قورئان لەسەر گەڵای دارخورما کان و سینەی پیاوان و کاغەزەکان کۆبکاتەوە. نوسراوەکان لای ئەبوبەکر و دواتر بەعومەر گەیشت و کاتێك ئەو مرد، حەفصە هەڵیگرت و لای خۆی پاراستی.
عوسمان کەسی نارد و نوسراوەکانی لەحەفصە وەرگرت و فەرمانیدا بەزەید کوڕی سابت و عەبدالله کوڕی زوبەیر و سەعید کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدولرەحمان کوڕی حەرەس کوڕی هشام کەگەلاکان دوبارە بنوسنەوە. عوسمان وتی: ئەگەر لەسەر خوێندنەوەی بەشێك یا وشەیەك ناسازگاریتان بۆ دروست بو، بەزاراوەی قورەیشی بیخوێننەوە چونکە قورئان بەزمانی ئەوان دابەزیوە. ئەم کارەیان کرد. کاتێك کارەکەیان تەواو کرد، نوسراوەکانیان بۆ حەفصە گەڕاندەوە و بۆ هەر سوچ و کەنارێکی

دەوڵەتی ئیسلامی قورئانێکی یەکسانی رەوانە کرد و ئەوانی دیکەی سوتاند و فەرموی تەنیا ئەو کەڵك لەو قورئانە وەربگرن و پشت بەوانی دیکە نەبەستن. خەڵکان هەمو هەستیان بەگەورەیی و راستی ئەم کارە کرد جگە خەڵکانی کوفە چونکە کاتێك قورئانەکەیان بەدەست گەیشت، هاوەڵانی پێغەمبەر(ص) شادمان بون بەڵام هاورێیانی عەبداللە کوڕی مەسعود و هاورێکانیان بەمە رازی نەبون و بەهۆکاری کەم و کوڕی لەقەڵەمیان دا. کوڕی مەسعود لەناو ئەواندا هەستا و وتی: هەموی ئەوەی بیستوتانە راست نیە، بەشێوەیەکی ئاشکرا پێش ئێوە کەوتونەتەوە. کەواتە چاوەڕوان بن. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالب هاتە کوفە، پیاوێك هەستا و رەخنەی لەعوسمان گرت کەقورئانەکانی کۆکردۆتەوە. عەلی هاواری کرد، دەمت داخە! عوسمان ئەم کارە گەورەی بەئاگاییەوە ئەنجام داوە و ئەگەر من ئەو کارەم دەکرد، بەهەمان رێگەی ئەودا دەڕۆشتم.

## کەوتنی مۆری پێغەمبەر(ص) لەچاڵی ئەریس

لەم ساڵەدا مۆری پێغەمبەر(ص) لەدەستی عوسمان خزا و کەوتە ناو چاڵی ئەریس (لەنزیك مەدینە). ئەم چاڵە ئاوی کەم تیابو. دوای ئەوە کەس نەیتوانی هەست بەقوڵاییەکەی بکات.

پێغەمبەر(ص) کاتێك ئەو مۆرەی هەڵگرت کەویستی نامە بۆ عەجەمەکان بنێرێت و پێشنیاری ئیسلامیان پێ بکات. ئەوان نامەی مۆر نەکراویان وەرنەدەگرت. پێغەمبەر(ص) فەرمانیدا مۆرێکی لەئاسن بۆ دروست بکەن. کاتێك مۆرەکە دروست کرا، کردیە پەنجەی خۆی. جبرەئیل دابەزی و رێگەی ئەم کارەی لێگرت. پێغەمبەر(ص) فڕیدا و فەرمانیدا مۆرێکی لەمس بۆ دروست بکەن و کردیە پەنجەی خۆی. جبرەئیل پێی وت: فڕی بدە. فڕیدا. پێغەمبەر(ص) فەرمانیدا ئەنگوستیلەیەکی زیوینیان بۆ دروست کرد و کردیە پەنجەی خۆی. جبرەئیل پێی وت بیپارێزێت و ئەو پاراستی. نیگارەکەی (محەممەد پێغەمبەر(ص)ی خوایە) سێ دێر بو: محەممەد، دێرێك، پێغەمبەر(ص) دێرێك و خوا دێرێك. پێغەمبەر(ص) لەپەنجەیدابو تا ئەو کاتەی مرد. ئەبوبەکر کردیە پەنجەی خۆی تا مرد و عومەر کردیە پەنجەی تا ماڵئاوایی لەجیهان

کرد. عوسمان بۆ ماوەی شەش ساڵ لەپەنجەیدا بو تا ئەوەی چاڵە ئاوێکیان بۆ موسوڵمانان هەڵکەند تا ئاوی لێ بخۆنەوە. ئەو لەسەر ئاوەکە دانیشت ویاری بەئەنگوستیلەکە کرد کە لەپەنجەی خزا و کەوتە ناو چاڵەکە. بەدوایدا گەڕان و هەمو ئاوەکەیان دەرهێنا بەڵام نەیاندۆزیەوە. عوسمان سامانێکی گەورەی بۆ کەسێك دەست نیشان کرد تا بیدۆزێتەوە. ئەو لەم کارە زۆر خەمبار بو و داخی زۆری خوارد. کاتێك لەدۆزینەوەکەی بێ هیوا بو، فەرمانیدا ئەنگوستیلەیەکی هاوشێوەیتریان بۆ دروست کرد کەتا رۆژی مردن لەدەستیدابو. کاتێك کوژرا، ئەنگوستیلەکە ون بو و کەس نەیزانی کێ هەڵیگرت.

## رەوانە کردنی ئەبوزەری غەفاری بۆ رەبزە

لەم ساڵەدابو ئەم روداوە پێش هات چونکە سەبارەت بەئەبوزەری غەفاری پێشتر ئاماژەی پێدرا کەمعاویە ئەوی لەشامەوە بۆ مەدینە رەوانە کرد. سەبارەت بەهۆکارەکەی ئاماژە بەگێڕانەوەی جۆراوجۆر دراوە وەك ئەوەی معاویە جوێنی پێدا و هەڕەشەی مردنی لێکرد و بێ زین سوار وشتری کرد و لەشامەوە بۆ مەدینەی نارد و دواتر عوسمان بەشێوەیەکی ناشیرین و نایاسایی ئەوی لەمەدینە دەرکرد کەئەم گێڕانەوەیە راست نیە و ئەگەر راست بێت، عوسمان بیانوی بەدەستەوەیە چونکە بۆ رێبەر شیاوە خەڵکەکەی خۆی بپارێزێن یا کوشتار و سەرکوت وئەشکەنجەیان بکات. لەم چەشنە بابەتانە فراوانە. مەگەر ئەوەی ئەم کردارە بکەنە هۆکاری سەرکۆنە کردنی عوسمان کەمن خوازیار نیم پێی.

بیانوگران دەڵێن کاتێك ئەبو سەودا هاتە شام، چاوی بەئەبوزەر کەوت وپێی وت: ئەی ئەبوزەر، ئایا لەمعاویە سەرت سورنامێنێت؟ ئەو دەڵێت: ئەم سامانانە سامانی خوایە. هەمو شتێك هی خوایە. پێم وابێت ئەو دەیەوێت لەدەستی خەڵکی دەربێنێت و بیکاتە ملکی خۆی و ناو و نیشانی موسوڵمانانی لێ بسڕێتەوە. ئەبوزەر هاتە لای و پێی وت: بۆ ئێستا سامانی موسوڵمانان بەسامانی خۆت ناو دەبەیت؟ معاویە وتی: ئەی ئەبوزەر، خوا لەتۆ خۆش بێت، ئایا ئێمە بەندەکانی خوانین؟ ئایا سامانەکان سامانی خوا نیە؟ ئەبوزەر وتی: ئیتر ئەوە مەڵێ. معاویە وتی: لەمەدوا دەڵێم سامانی موسوڵمانان. ئەبو

سەودا ڕۆشتە لای ئەبودەردا و وتی: سوێند بەخوا ئەم پیاوە بو ئەبوزەری غەفاری دژی تۆ هاندا.

ئەبوزەر بڕوای وابو شیاو نیە بۆ موسوڵمانەکان زیاتر لەخواردنی شەوانەڕۆژی خۆیان سامانیان هەبێت، هەروەها دەتوانێت شتێك هەڵبگرێت کەبیەوێت لەرێگەی خوادا خەرجی بکات یا بەگەورەیی خۆی بیبەخشێت. ئەوپشتی بەم ئایەی قورئان دەبەست کەدەفەرمێت: ئەوانەی زێر و زیو کۆدەکەنەوە و لەرێگەی خوادا خەرجی ناکەن، مژدەی ئەشکەنجەیەکی بەئازاریان پێبدە (توبە/٩/٤٣). ئەو لەشام لەناو خەڵکدا وەستا و وتی: ئەی بەتواناکان، لەگەڵ هەژارەکان بەرابەری بکەن، ئەوانەی زێر و زیو کۆدەکەنەوە و لەرێگەی خوادا خەرجی ناکەن، بەڵێنی ئەشکەنجەیەکی مەترسیداریان پێداون کەناوچاو و پشت و کەلەکەی ئەوان داغ دەکەن. بەردەوام بەمشێوەی دەوت تا هەژارەکان ئارەزوی ئەوەیان کرد و بەئەرکێکی پێویستی سەرشانی بەتواناکانیان بینی. بەتواناکانیش لەکردار و وتاری ئەوان بێزار بون. معاویە لەتاریکایی شەو هەزار دیناری بۆ نارد کەئەبوزەر دەست بەجێ لەناو هەژاراندا دابەشی کرد. کاتێك معاویە نوێژی بەیانی خوێند، بەو نێردراوەی وت کە بۆ لای ئەبوزەری ناردبو: بڕۆ لای ئەبوزەر و پێی بڵێ: جەستەی من لەئەشکەنجەی معاویە رزگار بکە چونکە ئەو منی بۆ لای خەڵکانێکی دیکە رەوانە کردبو و من بەهەڵە دینارەکانم بۆ تۆ هێنا. ئەبوزەر وتی: کوڕم پێی بڵێ: سوێند بەخوا لەدینارەکانی تۆ یەك دیناریش لای من نەماوەتەوە، سێ رۆژ مۆڵەتم پێ بدە تا کۆی بکەمەوە.

معاویە بینی ئاکارەکەی وتارەکەی پشت راست دەکاتەوە، بۆ عوسمانی نوسی: ئەبوزەر بارودۆخی لەسەر من دژوار کردوە. لەزیانی وتارەکانی ئەو بۆ هەژاران، ئەمە و ئەوە رویداوە. عوسمان بۆی نوسی: ئاگادار بە ئاژاوە چاو و لوتی خۆی نیشان داوە. لەسەر تۆ پێوستە بەهێز بیت و وشیار و برینی چڵکین بقڵیشێنیت. ئەبوزەر هاورێ لەگەڵ پیاوێکی ئاشنا بەکاروبارەکان بنێرە بۆ لای من و خەڵك و خۆت لەزیانی ئەم کارانە بەدور بگرە. معاویە ئەبوزەری بۆ لای عوسمان نارد.

کاتێك ئەبوزەر هاتە مەدینە و کۆبونەوەی خەڵکی لەداوێنی کوێستانەکانی سەلع بینی، وتی: مژدەیەك بەخەڵکانی مەدینە دەدەم بەهێرشێکی گیانبڕ و شەڕێکی خۆڕاگرانە!

ئەو هاتە لای عوسمان و عوسمان پێی وت: بۆ شامیەکان لەتوند و تیژی زمانی تۆ گلەیی دەکەن؟ ئەبوزەر هەمو روداوەکانی بێ کەم و کورِی بۆ عوسمان باس کرد. عوسمان وتی: ئەی ئەبوزەر، لەسەر منە خەڵك بەهەوڵدان بۆ هەزینە کردنی ژیان هان بدەم بەڵام شیاو نیە بۆ من ئەوان ناچار بەخۆپارێزی و پارێزکاری بکەم. ئەبوزەر وتی: لەدەوڵەمەندەکان خۆش مەبە تا رێگەی چاکەکاری بکەن و کردارێکی باش لەگەڵ برادەران و هاوسێکانیان بگرنەبەر و پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئەوان بەهێز بکەن. کەعب الاحیار کەلەوێدابو وتی: هەکەرس خەرجیە پێویستەکان بدات، کارەکەی خۆی بەکۆتایی هێناوە. ئەبوزەر لێیدا وسەری شکاند وپێی وت: ئەی پیاوی جولەکە زادە! تۆ کارت بەم کارانە چیە؟ تۆ لێرە چی دەکەیت؟ عوسمان داوای لەکەعب کرد لەئەبوزەر خۆش ببێت. ئەبوزەر بەعوسمانی وت: فەرمانیك بەمن بدە تا لەمەدینە برِۆم چونکە پێغەمبەر(ص) پێی وتم هەر کاتێك ماڵەکان گەشتنە کێوەی سەلع، لەمەدینە برِۆ. عوسمان فەرمانی پێدا. ئەبوزەر رِۆشتە رەبزە و مەزگەوتێکی لەوێ دروست کرد. عوسمان گایەلەیەکی( نزیکەی سی وشترِی) پێ بەخشی و لەگەڵ دو کۆیلە و رۆژی رۆژانەی بۆ دیاری کرد. هەروەها ئەم کارانەیشی بۆ رافع کورِی خەدیج کرد. ئەویش بەدوای هەواڵێك کەبیستبوی، لەمەدینە رِۆشتبوەدەر.

ئەبوزەر لەترسی ئەوەی نەکا دوبارە بیابان نشینی یەخەی بگرێتەوە، هەندێ کات سەری لەمەدینە دەدا. معاویە چەندین کەسی بۆ لای ئەو نارد. ئەوان رِۆشتنەدەر و هەمبانێکی پرِیان لەدەستا بو کەلەسەر دەستی پیاوێك قورسایی دەکرد. معاویە وتی: سەیری ئەم پیاوە بکەن کەداوا لەخەڵك دەکات لەم دنیایە خۆپارێزی بکەنە پیشە، چ بارێکی قورسی بۆ دەبەن! هاوسەرەکەی وتی: سوێند بەخوا ئەم تورەکەیە نەپرِە لەدینار نەدرەم (نەزێرە نەزیو) بەڵکو پشیزە مسینەکانە کەکاتێك هەر مانگ بەخششەکەی ئەویان لەگەنجخانە دەدا، پشیزەکانی بۆ بژێوی رۆژانە بەئێمە دەسپارد.

کاتێك رۆشتە رەبزە، نوێژی جەماعەتی دەستی پێکرد. پیاوێکی لێ بو کەسەرپەرەستی کاروباری خێر وخێرات بو. وتی: ئەی ئەبوزەر، برِۆ پێش تا لەپشت سەری تۆ نوێژ بخوێنین. ئەبوزەر وتی: نا، تۆ برِۆ پێش چونکە پێغەمبەر(ص) پێی وتم، فەرمانبەر و گوێرایەڵ بن هەرچەندە کۆیلەیەکی لوت برِاو بکەنە فەرماندەی ئێوە. تۆ کۆیلەیت

بەڵام لوت بڕوا نیت. ناوی موجاشیع بو و لەکۆیلە خێریەکان.

## ئاماژەدان بەچەند ڕوادوێك

لەم ساڵەدا عوسمان سێیەمین ئاوازی ڕۆژی هەینی لەزەوراء زیاد کرد.
هەروەها لەم ساڵەدا حاطب کوڕی ئەبی بەلتعەی لەخمی لەبەدریەکان مرد.
ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەمرۆ کوڕی ئەبی سەرحی فێهری لەبەدریەکان، مەسعود کوڕی ڕەبیع یا مەسعود کوڕی ڕەبیعە کوڕی عەمرۆ قاری لەقارە کەپێش ڕۆشتنی پێغەمبەر(ص) بۆ ماڵی ئەرقەم باوەڕی بەئیسلام هێنا و لەبەدر شەڕی کرد و لەتەمەنی شەست ساڵی ماڵئاوایی لەجیهان کرد. عەبداللە کوڕی کەعبی ئەنساری لەبەدریەکان کەلەشەڕی بەدر و شەڕەکانیتر سەرپەرەستی تالآنیەکانی پێغەمبەر(ص) بو، عەبداللە کوڕی مەعون برای عوسمان لەبەدریەکان و جەبار کوڕی صەخر لەشەڕکەرانی بەدر.

## روداوەکانی ساڵی سی و یەکەمی کۆچی (٦٥٢ زایینی)

### شەڕی صواری

دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا یا ساڵی ٦٥٤/٣٤ زایینی شەڕی صەورای رویدا. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٥٢/٣١ شەڕی ئەسوارانی رویدا. دەستەیەك دەڵێن: هەردوکیان لەساڵی ٦٥٢/٣١ زایینی رویاندا و فەرماندەیی موسوڵمانان لەدەستی معاویەدابو چونکە لەرۆژگاری خەلافەتی عوسمان معاویە ببو بەفەرمانڕەوایی سەراسەری شام.

هۆکاری فەرمانڕەوایی کردنی ئەو لەسەر شام ئەوە بو کەکاتێك سەردەمی مردنی ئەبوعوبەیدەی جەراح گەیشت، لەسەر ناوچەکانی ژێردەستی خۆی عەیاز کوڕی غەنەمی دیاری کرد کەخاڵ و کوڕەمامی ئەو بو. ئەو بەخشەرێکی بەناوبانگ بو، دەستەیەك بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا، دەڵێن: مەعاز کوڕی جەبەلی لەجێگەکەی خۆی دانا. عەیاز مرد و عومەر دوای ئەو سەعید کوڕی حوزەیمی جومەحی دەست نیشان کرد. سەعید مرد و عومەر لەجێگەکەی ئەو عومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری دانا. عومەر مرد و عومەیر فەرمانڕەوایی حمص و قێنسرین بو. یەزید کوڕی ئەبوسوفیان مرد و عومەر لەجیاتی ئەو براکەی معاویە کوڕی ئوبوسوفیانی هێنایە سەر کار. لەم رێگەوە، ئەردەن و دەمەشق کەوتنە ژێر دەستی معاویە. عومەیر کوڕی سەعد نەخۆش کەوت و داوای لەعوسمان کرد لەکار دوری بخاتەوە و فەرمانی پێبدات تا بۆ لای بنەماڵەکەی بگەڕێتەوە. عوسمان فەرمانی پێدا و حمص و قێنسرینی پەیوەستی فەرمانڕەوایی معاویە کرد. عەبدولرەحمان کوڕی عەلقەمە کەفەرمانڕەوایی فەلەستین بو، مرد و عوسمان ئەو ولاتەیشی بەمعاویە بەخشی. بەم شێوە بو سەراسەری شامی گەورە کەوتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی معاویە.

بەڵام هۆکاری شەڕەکە ئەمە بو کاتێك موسوڵمانان خەڵکی ئەفریقییەیان سەرکوت و کوشتار و دیل کرد، کونستانتین کوڕی هرلکلیوسی بەسوپایەکی گەورە لەرۆمیەکان کەلەسەرەتایی ئیسلامەوە سوپایەکەی لەو شێوە کۆنەکرابویەوە، هاتەدەر، ئەواه هاورێ لەگەڵ پێنسەد یا شەشسەد کەشتی شەڕکەر هاتنەدەر. موسوڵمانان روبەرویان بونەوە و فەرمانڕەوایی شام معاویە و فەرمانڕەوایی دەریا عەبداللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی

سەرح. کاتێك موسوڵمانان روبەروی رۆمیەکان بونەوە، با هەڵیکرد. مۆسوڵمانان و رۆمیەکان لەنگەریان گرت و با ئارام بویەوە. موسوڵمانان وتیان: ئەمان لەنێوان ئێمە و ئێوەدا هەبێت. شەویان بەسەر برد و موسوڵمانان قورئانیان خوێند و نوێژیان دەکرد و لەخوا دەپاڕانەوە. رۆمیەکان بەردەوام شەیپوریان لێدەدا. ئەوان کەشتیەکانی خۆیان نزیك کردەوە و موسوڵمانانیش بەهەمان شێوە. کەشتیەکانیان بەیەکەوە بەست و بەڕم و خەنجەر کەوتنە گیانی یەك. لەموسوڵمانان کەسانێکی زۆر کوژران و لەرۆمیەکان کەسانی فراوانتر. ئەو رۆژە بەشێوەیەك خۆڕاگریان کرد کەهاوشێوەکەی لەهیچ شەڕێکدا نەبینراوە. خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و کونستانتین بریندار و تێکشکاو هەڵات و لەرۆمیەکان جگە لەو کەسانەی هەڵاتن، کەس نەمایەوە. عەبدالله کوڕی سەعد دوای شکەستی دوژمن چەند رۆژێك لە زات ئەلصەورای مایەوە و دواتر گەڕایەوە. لەم شەڕەدا بۆ یەکەم جار محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە سەبارەت بەعوسمان قسەیان کرد و سەرکۆنەیانکرد کەئاڵو گۆڕی لەدینی خوادا دروست کردوە و شێوازی ئەبوبەکر و عومەری شێواندوە. وتیان: عەبدالله کوڕی سەعدی کردۆتە فەرماندار و ئەمە ئەو کەسەیە پێغەمبەر(ص) رشتنی خوێنی ئەوی بەڕەوا زانی و چەندین ئایەی قورئان بۆ خوانەناسی ئەو دابەزی. پێغەمبەر(ص)ی خوا چەندین کەسی لەخۆی دوخستەوە بەڵام عوسمان هەموویانی گەڕاندەوە. هاوەڵانی پێغەمبەر(ص) لەسەر کار لابرد و سەعید کوڕی ئەلاص و عەبدالله کوڕی عامری هێنایە سەر کار. ئەم هەواڵە بەعەبدالله کوڕی سەعد گەیشت. وتی: ئێوە دوانە لەگەڵ ئێمە سەرنەکەون. ئەو دوانە سوار کەشتیەك بون کەلێوانلێو بو لەقیبتیەکان. روبەروی دوژمن بونەوە و ئەو دوانە لەهەموان زیاتر لەسەر خۆ شەڕیان کرد و زیانێکی ئەوتۆیان لەدوژمن نەدا. پرسیاریان لێکردن و وتیان: چۆن لەگەڵ عەبدالله کوڕی سەعد شەڕ بکەین؟ عوسمان ئەوی هێناوەتە سەرکار، عوسمان ئەو کارە و ئەم کارەی کردوە. عەبدالله کەسی بۆ لای ئەو دوانە نارد و هەڕەشەی لێکردن و ئاگاداری کردنەوە. خەڵك لەوتاری ئەو دوانە کەوتنە خۆ و رەخنەیان لەعوسمان گرت و چەندین قسەیان هێنایە سەرزمان کەپێشتر باس نەدەکرا.

کۆنستانتین بەکەشتی رۆشتە جەزیری سیسیل، خەڵك پرسیاریان لێکرد و ئەو ئاگاداری

کردنەوە. وتیان: مەسیحیەکان لەناوچون و پیاوەکانیان بەرەو نەمان دەڕۆن. ئەگەر عەرەبەکان هێرش بکەنە سەر ئێمە، کەس نیە تا روبەرویان ببێتەوە. دواتر ئەویان بردە گەرماو وکوشتیان و هاورێکانیان خستە ناو کەشتی و فەرمانیان پێدان بۆ کۆنستانتین ئۆپێل بگەرێنەوە.

دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا حەبیب کوڕی موسلیمە دەستی بەسەر ئەرمەنستاندا گرت کەپێشتر ئاماژەی پێدرا.

## کوژرانی یەزدگێرد کوڕی شەهریار

بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا یەزدگێرد لەپارسەوە بەرەو خوراسان هەڵات. ناسازگاری گێڕانەوەی مێژوونوسان لەمبارەوە پێشتر ئاماژەی پێدرا. کاتێك عەبداللە کوڕی عامر بوبە فەرمانداری بەسرە، بەرەو پارس ڕۆشت و دەستی بەسەردا گرت. یەزدگێرد لەساڵی ٦٥٠/٣٠ زایینی لەشاری گور یا ئەردەشێر خەرە هەڵات. کوڕی عامر موجاشیع کوڕی مەسعود یا هەرەم کوڕی حەییانی یەشکری بەدوای ئەودا رەوانە کرد. ئەوتا کرمان بەدوای یەزدگێردا ڕۆشت. یەزدگێرد رویکردە خوراسان. موجاشیع کوڕی مەسعود و هاورێکانی گیرۆدەی بەفر و تەم و مژ بونەوە و سەرما زیادی کرد. بەرزایی بەفر دەگەشتە رمێك. سوپای موسوڵمانان لەناوچو و موجاشیع رزگاری بو و هەروەها پیاوێکیتر گیانی بەدەربرد کەکەنیزێکی پێبو. ئەو سکی وشترێکی دڕی، ژنەکەی تێکرد و هەڵات. بەیانی بۆ لای وشتر و کەنیزەکە گەڕایەوە و بینی ئەو مانگ روخسارە زیندوە، هەڵیگرت و لەو شوێنە رزگاری کرد.ئەو کۆشکە لەو کاتەوە بەکۆشکی موجاشیع ناو دەبەن چونکە سوپاکەی لەوێدا لەناوچون. کۆشکەکە لەپێنج یا شەش فەرسەخی سیرجان لەشارەکانی کرمان بو.

ئەم گێڕانەوەیە بەپێی گێڕانەوەی کەسێکە کەدەڵێت: یەزدگێرد لەم ساڵەدا لەپارس هەڵات.

بەڵام هۆکاری کوژرانەکەی بەپێی ئەوەی لەکاتی گرتنی پارس و خوراسان ئاماژەی پێدرا، مەبەستی ناسازگاری زاناکان لەم بوارەدایە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو هاورێ لەگەڵ دەستەیەك، لەناو ئەوان خۆڕزاد برای رۆستەم، لەکرمانەوە بەرەو مەرو هەڵات. خۆرزاد

سەبارەت بەرێزگرتن لەشای شاکان نامەی بۆ ماهویە پارێزگاری مەرو نوسی و خۆی بۆعێراق گەڕایەوە. یەزدگێرد داوای سامانی لێکرد بەڵام ماهویە خۆی لەدانی سامان بەدور گرت. خەڵکانی مەرو، بەبونی ئەو لەناو خۆیاندا ترسان وکەسیان بۆ لای تورکەکان نارد و داوای هاوکاریان لێکردن. تورکەکان هاتن و شەوانە و لەناکاو هێرشیان کردە سەریان و هاورێکانی ئەویان کوشت. یەزدگێرد پیادە ڕۆشتە روباری مورغاب و پەنای بردە ماڵی پیاوێك کەبەردی ئاشی دەتاشی. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو خەڵکانی مەرو هێرشیان کردە سەری و داوای هاوکاریان لەتورکەکان نەکرد. خەڵکانی مەرو هاورێکانی ئەویان کوشت و یەزدگێرد هەڵات و بەرد تاش کوشتی. ئەوان بەجێگە پێکانی ئەودا تا ماڵی بەرد تاشەکە ڕۆشتن و ئەویان گرت و لێیان دا و ئەویان بەکوشتنی شای شاکان ناچار کرد و دواتر خۆی و بنەماڵەکەیان کوشتار کرد.

یەزدگێرد لێرە لەگەڵ ژنێك نزیکی کرد. ئەو کوڕێکی لێو قەڵشاو (یانیوسەری) هێنایە دونیا کەدوای کوژرانی باوکی چاوی بەدونیا هەڵهێنا و لەبەر ئەمە پێیان وت (نیوەزا) بۆ ئەم کوڕە لەخوراسان چەندین مناڵ هاتنە دونیا. کاتێك قەتیبە کوڕی موسلیم دەستی بەسەر سەغددا گرت، دو کچی لەمناڵەکانی نیوەزا دۆزیەوە کەهەدوکیانی بۆ لای حەجاج رەوانە کرد. ئەو کچەکانی رەوانەی دەرباری عەبدولەلیك کرد کەیزید کوڕی وەلید (کەمکراوی) بۆ هێنایە دونیا. یەزدگێردیان لەروبارەکە دەرهێنا و خستیانە ناو تابوت و لەگۆڕێکی بەردیندا بەخاکیان سپارد.

دەستەیەك دەڵێن: یەزدگێرد دوای شەڕی نەهاوەند بۆ سەرزەمینی ئیسفەهان هەڵات و پیاوێك بەناوی (متیار) لەوێ دەژیا. ئەو لەعەرەبەکان شتێکی کەمی بەدەست هێنابو و لەبەر ئەمە پێگەیەکی بەرزی بو. رۆژێك متیار هاتە لای یەزدگێرد تا بڕواتە پێشگای شای شاکان، بەڵام دەرگاوان رێگەی لێ گرت تا مۆڵەتی بۆ وەربگرێت. متیار لێیدا و برینداری کرد. دەرگاوان خوێناوی ڕۆشتە لای یەزدگێرد. شای شاکان لەهەمان کات لەئسفەهان هاتەدەر وبەرەو رەی بەرێکەوت. خواوەندی تەبەرستان پێشوازی لێکرد و وڵاتەکەی پێشکەش کرد بەڵام یەزدگێرد رازی نەبو.

دەستەیەك دەڵێن: هەمان کات ڕۆشتە سیستان و لەگەڵ هەزار سوارە ئاهەنگی مەروی کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نیە بەڵکو روی لەپارس کرد و لەوێ چوارساڵی

بەسەر برد. دواتر ڕۆشتە کرمان و دو یا سێ ساڵ لەوێ مایەوە. فەرمانداری ئەوێ داوای شتێکی لێکرد کەیەزدگێرد رازی نەبو و ئەو ڤاچی گرت و لەوڵاتەکەی خۆی دەریکرد. دواتر ڕۆشتە سیستان وبۆ ماوەی پێنج ساڵ لەوێ مایەوە و ئاهەنگی خوراسانی کرد و سوپای کۆکردەوە و ئەوانی بۆ شەڕی عەرەبەکان برد. ڕۆشتە مەرو و چەندین بارمتە لەمناڵی پارێزگارەکان هاوڕێیەتی فەرۆخزادیان دەکرد. کاتێك گەشتە مەرو، دەستی بەنامە نوسین بۆ پاشاکانی چین و کابول و خەزەر و فەرغانە کرد و داوای هاوکاری لێکردن. فەرمانداری مەرو لەو کاتەدا ماهویە کوڕی بوراز بو. ماهویە کوڕەکەی لەمەرو دانا تا لەبەرابەر یەزدگێرد پارێزگاری لێ بکات و ڕێگەی پاشا لەڕۆشتن بۆ ئەوێ بگرێت نەکا زیانی پێ بگەیێنێت. رۆژێك یەزدگێرد سوار بو و بەشاردا سوڕا و هەوڵیدا لەیەکێك لەدەروازەکان بڕواتەدەر. بوراز ڕێگری لێکرد و بردیە ژوور. باوك لەلایەك هاواری دەکرد دەرگاکە بکاتەوە و لەلایەکی دیکە هاواری دەکرد نەیکاتەوە. کوڕ، دەرگاکەی نەکردوە. یەکێك لەهاوەڵانی یەزدگێرد هەستی بەم پیلانە کرد و شای لێ ئاگادار کردەوە و داوای فەرمانی کرد تابوراز بکوژێت. یەزدگێرد ڕێگەی پێنەدا.

دەستەیەك دەڵێن: یەزدگێرد ماهویەی لەسەر کارەکەی لابرد و بەکوڕی براکەی سەنجانی سپارد. ئەم هەواڵەی بەماهویە گەیشت وبۆ لەناو بردنی پاشا هەوڵیدا. نامەی بۆ نەیزەك تەرخان نوسی و داوای لێکرد بگاتە لای ئەو تا بۆ کوشتنی پاشا و ئاشتی کردن لەگەڵ عەرەبەکان ڕێککەون. پەیمانی پێدا ئەگەر ئەم کارەی لەگەڵ بکات رۆژی هەزار درەمی پێ دەبەخشێت. نەیزەك نامەی بۆ یەزدگێرد نارد و مژدەی هاوکاری پێدا لەبەرابەر عەرەبەکان و داوای لێکرد بڕواتە لای ئەو و سوپاکەی و فەرۆخزاد لەخۆی دور بکاتەوە. یەزدگێرد لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد و سەنجان پێی وت. من ئەم ڕێگایە پەسەند ناکەم کەسوپا و فەرۆخزاد لەخۆت دور بخەیتەوە. باوکی بوراز وتی: پێم باشە وەڵامی نەیزەك بدەیتەوە و ئەوەی داوای دەکات، ئەنجامی بدەیت. ئەو بۆچونی باوکی بورازی بەکار بەست و سوپا و هاورێکانی خۆی بڵاوە پێکرد. فەرۆخزاد هاواری کرد، یەخەی خۆی دڕی و وتی: من گومانم وایە ئێوە دەتانەوێت ئەم پیاوە بکوژن. فەرۆخزاد ئەوەندە پێداگری کرد تا یەزدگێرد بەدەست خەتی خۆی نامەی بۆ

نوسی کەئەو لەئەماندایە و ئەوە کەیەزدگێرد و هاورێکان و سامانەکانی ئەوی بەماهویە سپاردوە. یەزدگێرد بۆ ئەوەی نوسی، چەندین شایەتی گرت. نەیزەك پێشوازی لەیەزدگێرد کرد. باوکی بوراز رێنوێنی کرد تا ئەم کارە بکات. کاتێك روبەروی بویەوە، باوکی بوراز، دواکەوت و نەیزەك پیادە پێشوازی لێکرد. یەزدگێرد یەکێك لەئەسپەکانی خۆی پێ بەخشی کەنەیزەك سواری بو. کاتێك گەشتە ناو سوپاکەی، نەیزەك لەگەڵ ئەودا گەرمی گفتوگۆ بو و وتی: یەکێك لەکچەکانی خۆت بکەرە هاوسەری من تا دڵپاکانە شەڕی دوژمنانت بکەم. یەزدگێرد جوێنی پێدا و نەیزەك بەرمەکەی خۆی کێشای بەسەریدا. یەزدگێرد هاواری کرد و هەلآت. هاورێکانی نەیزەك دەستیان بەکوشتنی هاورێکانی یەزدگێرد کرد. یەزدگێرد پەنای بردە بەر ماڵی ئاشەوانێك و سێ رۆژ لەوێ مایەوە بەلآم نانی نەخوارد. ئاشەوان پێی وت: ئەی پیاوی بەدبەخت، وەرەدەر و خواردن بخۆ چونکە لەبرسانا دەمریت! یەزدگێرد وتی: ناتوانم خواردن بخۆم مەگەر ئەوەی بڕۆمە سەر سفرەی کەسێك کەسرودی تایبەتی خوایی بخوێنێت. ئاشەوان پیاوێکی لابو کەبەم شێوەیە سرودی دەخوێند. ئاشەوان داوای لێکرد و هات و سرودی خوایی خوێند و یەزدگێرد نانی خوارد. کاتێك ڕۆشت، بیستی خەڵك سەبارەت بەیەزدگێرد قسە دەکەن. پرسی: جل وبەرگەکەی چۆنە؟ ئەوان پێیان وت. ئەو پیاوە چۆنیەتی جل و بەرگ و نیشانیەکانی ئەوی بەخەڵکدا. باوکی بوارز پیاوێکی لەئەسواران بۆ لای یەزدگێرد نارد و فەرمانی پێدا شا بخنکێنێت وبیخاتە ناو روبارەکە. پیاوەکە هاتە لای ئاشەوان، لێیدا تا شوێنی یەزدگێردی پێ بڵێت. ئاشەوان حاشای کرد و وتی ئەو پیاوە لێرە نیە. کاتێك ویستی بگەڕێتەوە، یەکێك لەهاورێکانی وتس: من لێرە بۆنێکی خۆش دەکەم. ئەو سەیری جلێکی هەوریشمینی کرد کە لەناو ئاودا بو. رایکێشا وبەیەزدگێرد گەیشت. پاشا داوای لێکرد نەیکوژێت و شوێنەکەی بەکەس نەڵێت. ئەو ئەنگوستیلە و پشتێن و دەسبەندە زێڕینەکەی خۆی بەو پیاوە بەخشی. پیاو وتی: چوار درەم بەمن ببەخشە تا رزگارت بکەم. یەزدگێرد پارەی پێ نەبو. پێی وت: ئەم ئەنگوستیلەی من بەهایەکی بێ ئەندازەی هەیە، هەڵیگرە. پیاوەکە رازی نەبو. یەزدگێرد وتی: بەردەوام پێیان دەوتم رۆژێك نیازت بەچوار درەم دەبێت. ئەمە ئەو رۆژە شوومەیە. دواتر یەکێك لەگوارەکانی خۆی دەرهێنا و دای بەئاشەوان تا کەس

لەنهێنەکەی ئاگادار نەکاتەوە. ویستیان بیکوژن. شای شاکان وتی: هاوار لەئێوە! ئێمە لەنوسراوەکانی خۆماندا خوێندومانە هەر کەسێك پاشا بکوژێت، خواوەندی پاك ئەو بەئاگری ئەم جیهانە دەسوتێنێت. مەمکوژن، بمبەن بۆ لای پارێزگارەکان یا عەرەبەکان چونکە وەك من پیاوێك بەزیندویی دەهێڵنەوە. ئەوان هەمو زێر و زیو و جل و بەرگەکانیان لێسەند و بەسیمی کەوان خنکاندیان و خستیانە ناو ئاو. قەشەی مەرو لەئاو دەریهێنا وخستیە ناو تابوت و بەخاکی سپارد. باوکی بوراز بەدوای یەکێك لەگوارەکاندا گەڕا و ئەو کەسەی ڕێگەی ئەوی نیشاندا، گرتی و ئەوەندەی لێدا تا گیانی دا.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو، بەڵکو یەزدگێرد پێش هاتنی عەرەبەکان بۆ کرمان، لەم شارە ئاهەنگی مەروی کرد و هاورێ لەگەڵ چوار هەزار کەس لەتبس و کوێستان تێپەڕی و بەرەو مەرو بەڕێکەوت. کاتێك گەشتە نزیك مەرو، دو سەردار بەناوەکانی بوراز و سەجان پێشوازیان لێکرد. ئەم دوانە ڕقی یەکیان لەدڵدابو. بوراز لەزیانی سەنجان قسەی دەکرد بەئەندازەیەك کەیەزدگێرد ئاهەنگی کوشتنی کرد. ئەم وتەیە بەگوێی یەکێك لەژنەکان گەیشت و بابەتەکە ئاشکرا بو. سەنجان هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و ئاهەنگی یەزدگێردی کرد. بوراز هەڵات و یەزدگێردیش ترسا و هەڵات.

گەشتە ئاشێك لەدو فەرەسخی مەرو و ڕۆشتە ماڵی ئاشەوان. ئاشەوان خواردنی پێدا و داوای شتی لێکرد. یەزدگێرد پشتێنە زێڕینەکەی خۆی بەو بەخشی. پیاو پێی وت: چوار درەمم بەسە. بەڵام پاشا پارەی پێ نەبو. یزدگێرد خەوت. ئاشەوان بەتەور کوشتی و هەرچی پێبو، هەڵیگرت و جەستەی خستە ناو روبار. ورگی هەڵدری و شتی قورسی تێکرد تا لەئاوەکەدا نوقم بێت.

قەشەیەك کە لەمەرو دەژیا، هەواڵی کوژرانەکەی بیست و مەسیحیەکانی کۆکردەوە و وتی: کوڕی شەهریار کوژراوە. شەهریار کوڕی شیرین هەمان ژنی خواپەرستە کەرێزداری و چاکەکاری ئەو لەگەڵ خەڵکەکەی خۆتان دەزانن و هەروەها دەزانن مەسیحیەکان لەرۆژگاری باوەگەوڕێی ئەو ئەنەوشیروان چ پێگەیەکی گەورەیان پێبڕا. شیاوە بۆ مەرگی ئەو شین بگێڕین و ئارامگایەکی بەردینی بۆ دروست بکەین. ئەوان بەوتارەکەی ڕازی بون و ئارمگایەکی بەردینیان بۆ دروست کرد و جەستەکەیان لەئاو

دەرهێنا و کفنیان کرد ولەو ئارامگادا بەخاکیان سپارد.

رۆژگاری پاشایەتی ئەو بیست ساڵی خایاند. لەم ماوەدا چوار ساڵ لەئارامیدا و شانزە ساڵی لەشەڕ و هەڵاتن لەعەربەکان بەسەر برد. دوایین کەس لەبنەماڵەی ئەردەشێر کوڕی بابەك بو. دوای ئەو، فەرمانڕەوایی بۆ عەرەبەکان تەخت بو.

## رەوانە بونی کوڕی عامر بەرەو خوراسان و دەست گرتن بەسەر ئەو سەرزەمینە

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کوژرا، خەڵکی خوراسان پەیمانی خۆیان شکاند و رێگەی ناسازگاریان گرتەبەر. ئەو کاتەی عەبداللە کوڕی عامر دەستی بەسەر پارسدا گرت، حەبیب کوڕی ئەوسی تەمیمی رۆشتە لای ئەو و وتی: ئەی فەرمانده، سەراسەری زەوی لەبەردەم تۆدایە و تەنیا بەشێکی کەمی دەستی بەسەرداگیراوە. بەرێکەوە خوا پشتیوانی تۆیە. وتی: مەگەر جیاواز لەومیە کەفەرمانیان پێداوین بەرێکەوین؟ نەیویست دان بەوەدا بنێت کە بەبۆچونەکەی رازی بوە. دەستەیەك دەڵێن: کاتێك کوڕی عامر دەستی بەسەر پارسدا گرت، بەرەو بەسرە گەڕایەوە و شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی لەئیستەخر دانا کەبناغەی مزگەوتی ئیستەخری داڕشت. کاتێك گەڕایەوە بۆ شاری بەسرە، ئەحنەف کوڕی قەیس یاکەسێکیتر رۆشتە لای ئەو وتی: دوژمنەکانت لەبەردەم تۆ هەڵدێن و لەشمشێرەکەت، دەترسن بەرێکەوە کەخوا پشتیوانی تۆیە و رێز لەئایینەکەی خۆی دەگرێت. ئەو ساز وبەرگ و کەل وپەلی شەڕی هەڵگرت و زیاد کوڕی نوبیەی لەبەسرە دانا وبەرێکەوت. رۆشت کرمان و موجاشیع کوڕی مەسعودی سەلی کردە فەرماندە کە لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ص) بو و فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ خەڵکانی کرمان بکات. ئەوانیش پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو. هەروەها رەبیع کوڕی زیادی حەرەسی کردە فەرمانڕەوایی سیستان چونکە سیستانیەکانیش پەیمانیان شکان و رێگەی ناسازگاریان گرتەبەر. کوڕی عامر رۆشتە نەیشابور و ئەحنەف کوڕی قەیسی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی. رۆشتە دو تبس کە دوقەڵا بون و بەدەروازەکانی خوراسان هەژمار دەکران. خەڵك ئاشتیان لەگەڵدا کرد. لەوێوە بەرەو کوێستان (گەناباد، فیردەوس و بیرجەند) رۆشت. خەڵکانی ئەوێ روبەروی بونەوە و شکەستیان خوارد و بۆ

ناو قەلاَکانی پاشەکشێی پێکردن. کوڕی عامر ڕۆشتە ئەوێ و لەسەر بنەمای دانی شەشسەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوی ڕۆشتە کوێستان، ئومەیر کوڕی ئەحمەری یەشکوری بو. ئێرە سەرزەمینی بەکر کوڕی وایل بو. عەبدالله کوڕی عامر سوپایەکی ڕەوانەی زام یەکێك لەشارەکانی نەیشابور کرد و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و هەروەها بۆ گرتنی باخرەز و جوین ( لەشارەکانی نەیشابور) خۆی ئامادە کرد.

کوڕی عامر ئەسوەد کوڕی کلسومی عەدەوی لەخەڵکی عودەی ئەلرەباب کەپیاوێکی پارێزکار بو، ڕەوانەی بەیهەق کرد کەئەمیش یەکێك لەشارەکانی نەیشابورە. ئاهەنگی پایتەختەکەی کرد و لەکەلێنێکەوە ڕۆشتە ناوشار. لەگەڵ ئەو دستەیەك لەموسوڵمانان ڕۆشتنە ناوشار. دوژمن ئەو کەلێنەی لێ بەستن. ئەسوەد ئەوەندە شەڕی کرد تا خۆی و دەستەیەك لەهاورێکانی کوژران. دوای ئەو براکەی ئیبراهیم کوڕی کولسوم سەرۆکایەتی خەڵکی گرتەدەست. ئەو توانی دەست بەسەر بەیهەقدا بگرێت. ئەسوەد بەردەوام لەخوا دەپاڕایەوە تا لەڕۆژی هەستانەوە ئەو لەسکی دڕندەکان و باڵندەکان هەستێنێتەوە. لەبەر ئەمە براکەی ئەوی بەخاك نەسپارد. کوژراوەکان، بەخاك سپێردران. کوڕی عامر دەستی بەسەر بشتیشدا گرت.

هەروەها دەستی بەسەر خەواف و ئەسفرایین و ئەرغیاندا گرت. دوای ئەوەی دەستی بەسەر هەمو شارەکانی سەر بەنەیشابوردا گرت، ئاهەنگی نەیشابوری کرد. بۆ ماوەی یەك مانگ گەمارۆی خستەسەر. لەهەر گەڕەك یا سوچێك فەرماندارێکی ئێرانی لێ بوکەپارێزگاری لەناوچەکەی خۆی دەکرد. خاوەنی یەکێك لەگەڕەکەکان داوای ئەمانی کرد لەسەر ئەو بنەمایەی ئەوان بباتە ناو شار. ئەو شەوانە ئەوانی بردە ناوشار کەدەروازەکانیان کردەوە. فەرماندەی گەورەی ئەوان لەگەڵ دەستەیەك لەیەکێك لەقەلاَکاندا خۆی حەشاردا. ئەو لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی هەمو نەیشابور داوای ئەمانی کرد.. کوڕی عامر لەسەر وەرگرتنی هەزار هەزار درەم (یەك ملیۆن درەم) پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. قەیس کوڕی هەیسەمی لەنەیشابور دانا و سوپایەکی بۆ ئەبیوەرد و نەسا ڕەوانە کرد و بەئاشتی دەستیان بەسەر ئەو دوناوچەدا گرت. سوپایەکی دیکەی بەفەرماندەیی عەبدالله کوڕی خازمی سەلەمی بۆ سەرەخس ڕەوانە

کرد. ئەم سوپایە لەگەڵ خەڵکی ئەوێ شەڕیان کرد و دواتر سەرەخسیەکان لەسەر ئەمان درانی سەد پیاو داوای ئاشتیان کرد. بەداواکەیان رازی بون. فەرمانڕەوایی سەرەخس لەسەر ئەم بنەمایە ئاشتی بەست و ناوی سەد پیاوی برد بێ ناوهێنانی خۆی. عەبداللە ئەوی کوشت و بەزۆر دەستی بەسەر سەرەخسدا گرت.
فەرمانداری توس هاتە لای کوڕی عامر و لەسەر بنەمای دانی شەشسەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. سوپایەکی دیکەی بەسەرکردایەتی عەبداللە کوڕی خازم یا کەسێکیتر رەوانەی هەرات کرد. فەرمانداری هەرات ئەم هەواڵەی بیست و ڕۆشتە لای کوڕی عامر و لەسەر بنەمای تەسلیم کردنی هەرات وباغیس و پوشەنگ پەیمانی ئاشتی بەست. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو کوڕی عامر هاورێ لەگەڵ ئەم سوپایە ڕۆشتە هەرات و خەڵك شەڕیان لەگەڵ کرد و دواتر فەرمانداری ئەوێ لەسەر بنەمای هەزار هەزار (یەك ملیۆن درەم) پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. کاتێك کوڕی عامر دەستی بەسەر ئەم شارانەدا گرت، فەرمانڕەوای بەلخ کەسێکی بۆ لای ئەو رەوانەکرد. کوڕی عامر لەسەر بنەمای وەرگرتنی دو هەزار هەزار و دوسەد هەزار (دو ملیۆن و دوسەد هەزار) پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. دەستەیەکیتر ئاماژەیان بەگێڕانەوەی جیاواز داوە. کوڕی عامر حاتەم کوڕی نوعمانی باهلی رەوانەی لای فەرمانداری بەلخ کرد. هەمو مەرو لەئاشتی ژیانی بەسەر دەبرد جگە لەیەك گوند کەپێیان دەوت سێنج. کوڕی عامر ئەحنەف کوڕی قەیسی بۆ تەخارستان رەوانە کرد. ئەو لەگوندێك تێپەڕی کەئێستا بەگوندی ئەحنەف بەناو بانگە و لەو کاتەدا بەسەوانگەرد ناودەبرا. گەمارۆی خستەسەر خەڵکەکەی و ئەوان لەسەر بنەمای دانی سێسەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. ئەحنەف وتی: دەبێت ئەمەیش لەناو پەیمانەکەدا بێت کەپیاوێك لەئێمە بڕواتە سەر کۆشکەکە و بانگ بڵێت و لەناو ئێوەدا نوێژ بخوێنێت و بگەڕێتەوە. ئەوان بەمە کارە رازی بون. ئەحنەف ڕۆشتە مەرورود و شەڕی خەڵکانی ئەو سەرزەمینەی کرد و کوشتاری کردن و گەمارۆی خستنەسەر. فەرمانڕەواکەی لەخزمەکانی بازان پاشای یەمەن بو. ئەو لەگەڵ ئەحنەف لەسەر بنەمای دانی شەشسەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتی بەست. ئەحنەف سوپایەکی رەوانە کرد و دەستیان بەسەر دێهاتی بەغ دا گرت و مەڕوماڵاتەکەیان تاڵان کرد. دواتر

سوپاکە لەگەڵ خەڵکی ئەو سەرزەمینە پەیمانی ئاشتیان بەست. خەڵکی تەخارستان خۆڕاگریان کرد. خەڵکانی گوزگان و تاڵەقان و فاریاب و شوێنەکانی دەوروبەریان بەسوپایەکی گەورە کۆبونەوە. هەردو لای شەڕکەر ڕیزیان بەست و شەڕیان دەست پێکرد. پاشای چەغانیەکان هێرشی کردە سەر ئەحنەف، ئەحنەف ڕمەکەی لەدەست دەرهێنا و شەڕی کرد. ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و عەرەبەکان بەهەر شێوەیەك دەیانویست، ئەوانیان کوشتارکرد و ئەحنەف بۆ مەروروڕود گەڕایەوە. دەستەیەك لەئێرانیەکان پەیوەستی گوزگان بون. ئەحنەف، ئەقرەع کوڕی حابسی تەمیمی لەگەڵ چەندین سوار بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانەکرد و وتی: ئەی بەنی تەمیم یەکترتان خۆش بوێت و بەخشینەکانتان بەیەك ببەخشن تا کاروبارەکانتان ڕولەڕاستی و دروستی بکەنەوە خۆپارێزی لەورگ و شەرمی خۆتانەوە دەست پێبکەن تا دینەکەتان بەبەهێزی بمێنێتەوە. لەفریو و پەیمان شکێنی خۆتان بەدور بگرن تا لەڕۆژی شەڕ سەرکەوتن بەدەست بێنن.

ئەقرەع بەڕێکەوت و لەگوزگان روبەڕوی دوژمن بویەوە. موسوڵمانان هێرشیان برد و دواتر گەڕانەوە و ئێرانیەکانیان شکەستدا و بەزەبری هێز دەستیان بەسەر گوزگاندا گرت. کوڕی غەریزەی نەهشەلی وتی:

| سقى صوب السحاب اذا ستهلت | مصارع فتية بالجوزجان |
|---|---|
| الى القصرين من رستاق خوت | اقادهم هناك الا قرعان |

یانی:

خۆزگە هەورە پڕبارانەکان لەکاتی گەوهەر پرژاندن لەسەر گۆڕی ئەو جوامێرانەدا ببارن کەلەگوزگان ئارامیان گرتوە. بەرەو لای دو کۆشك لەگوندی خوت کەدوسەردار بەناوەکانی ئەقرەع هەموی ئەوانی بردە ئەوێ ( یا لەوان لەوێ تۆڵەی سەند).

ئەحنەف بەشێوەی ئاشتیانە دەستی بەسەر تاڵەقان و فاریبادا گرت. دەستەیەك دەڵێن: ئەمیر کوڕی ئەحمەر دەستی بەسەردا گرت. دواتر ئەحنەف بەرەو بەلخ بەڕێکەوت کەهەمان گەورە شاری تەخارستانە. خەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی چوارسەد یا حەوتسەد هەزار دینار پەیمانی ئاشتیان بەست. ئەو ئەسید کوڕی موتەشەمیسی لەبەلخ دانا و خۆی بەرەو خوارەزم بەڕێکەوت کە لەقەراغ ئامودەریا جێگیرە بەلاّم نەیتوانی

دەستی بەسەردا بگرێت. راوێژی لەگەڵ هاورێکانی کرد و حوزەین کوڕی مونزەر پێی وت: عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب دەڵێت:

اذا لم تستطع امرا فدعه و جاوزه الى ما تستطيع

یانی: کاتێك توانای ئەنجامی دانی کارێکت نیە، چاوی لێ بپۆشە وسەر ڤاڵی کارێك ببە کەتوانای ئەنجامدانیت هەیە.

گەڕایەوە بۆ بەلخ و بینی ئەسید بەئاشتی دەستی بەسەردا گرتوە. کاتێك ئەو سازگاری خۆی بۆ ئاشتیەکەی ئەوان دەردەبڕی، جەژنی پیرۆزی (مێهرگانی) ئێرانیەکان کاتەکەی هات. ئەوان دیاری فراوانیان لە درەم و دینار و مەڕ و ماڵات و جل و بەرگ و هاوشێوەکانی دیکە بۆ هێنا. وتی: ئەمانە لەناو پەیمانی ئاشتیەکەی ئێمەدا نیە! وتیان: راستە بەلاّم ئەمە کارێکە لەم رۆژەدا لەگەڵ فەرمانڕەواکانی خۆمان دەیکەین. وتی: نازانم ئەمە چیە، ئەگەری هەیە شیاو نەبێت بۆ من. بەلاّم وەریان دەگرم تا بزانم چی پێش دێت. وەریگرت تائەحنەف هات. ئەسید لەو روداوە ئاگاداری کردەوە. ئەحنەف پرسیاری لەبەلخیەکان کرد وئەوانیش هەمان وەلاّمیان دایەوە. دیاریەکانی بردە لای کوڕی عامر و ئاگاداری کردەوە. کوڕی عامر وتی: ئەی ئەبو بەحر، هەڵیانگرە. ئەحنەف وتی: من پێویستم بەوانە نیە. کوڕی عامر هەڵیگرت.

حەسەنی بەصری وتی: قورەشی ئەوانی پەیوەستی سامانەکەی خۆی کرد چونکە پیاوێکی پارەپەرەست بو.

هەمو ئەم سەرکەوتنانە بەکوڕی عامر بڕا. خەڵك پێیان وت: هەمو ئەم سەرزەمینانەی تۆ دەستت بەسەردا گرتوە، کەس دەستی بەسەردا نەگرتوە: پارس، کرمان، سیستان، خوراسان. عەبدالله کوڕی عامر وتی: بەناچاری بەمشێوەیە سوپاسی خوا دەکەم کەلێرەوە بەجل و بەرگی ئیحرام بڕۆمە حەج. ئەو لەنەیشابورەوە جل وبەرگی عەمرەی لەبەر کرد و قەیس کوڕی هەیسەمی لەخوراسان دانا و بەرێکەوت و لەمەدینە ڕۆشتە لای عوسمان. دوای ڕۆشتنی ئەو، قەیس بەرەو تەخارستان بەرێکەوت. ڕۆشتە هەر شارێك، خەڵکەکەی ئاشتیان لەگەڵ کرد و دڵ و گیانیان بەفەرمانەکانی ئەودا. سەرئەنجام گەیشتە سەمەنگان کەخەڵکەکەی خۆڕاگریان کرد. قەیس گەمارۆی خستنەسەر و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەیاندا گرت.

## دەست بەسەردا گرتنی کرمان

وەك چۆن پێشتر ئاماژەمان پێدا، عەبداللە کوڕی عامر لەکرمانەوە بەرەو خوراسان ڕۆشت و موجاشیع کوڕی مەسعودی سەلی لەکرمان دانا و فەرمانی پێدا دەستی بەسەردا بگرێت چونکە خەڵکەکەی پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو و ناسازگاریان دەست پێکرد. ئەو بەزۆر دەستی بەسەر هەمیددا گرت و خەڵکەکەی نەکوشت وئەمانی پێدان. کۆشکێکی لەوێ دروست کرد کە بەکۆشکی موجاشیع ناسراوە. دوای ئەوە ڕۆشتە سیرجان کەگەورە شاری کرمانە. چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە و خەڵکەکەی لەناو قەلاَکاندا سەنگەریان گرتبو. شەڕی لەگەڵ کردن و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەیاندا گرت. دواتر زۆربەی خەڵکی ئەو شارە کۆچیان کرد. بەزۆر دەستی بەسەر جیرۆفت دا گرت. ڕۆشتە ناو قولایی کرمان و خەڵکەکەی سەرکوت و ریسوا کرد. دواتر ڕۆشتە (قفص) کەلەوێ سوپایەکی گەورە بۆ روبەروبونەوەی کۆببونەوە. ئەم سوپایە ئەو ئێرانیانە بون کە لەشوێنەکانی دیکەوە کۆچیان کردبو. شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و تێکی شکاندن و بەسەریاندا سەرکەوت. زۆر لەخەڵکی کرمان هەلاَتن و رویان لەدەریا کرد. دەستەیەکیان پەیوەستی مەکران بون و دەستەیەکیان پەیوەستی سیستان. زەوی و ماڵەکانی ئەوان تەسلیمی عەرەبەکان کرا. عەرەبەکان سەر لەنوێ ئەو ناوچانەیان نوژەن کردەوە و کارێزیان هەڵکەند و لەداهاتەکەی یەك لەسەر دەیان بەگەنجینە تەسلیم دەکرد.

## گرتنی سیستان و کابول و سەرزەمینەکانیتر

لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب ئاماژەمان بەگرتنی سیستان دا. خەڵك دوای ئەو پەیمانەکەی خۆیان شکاند. کاتێك عەبداللە کوڕی عامر رویکردە خوراسان، لەکرمان ڕەبیع کوڕی زیادی حارسی ڕەوانەی سیستان کرد. ئەو بیابانەکانی بڕی تا گەیشتە قەلاَی زالق. لەرۆژی جەژنی مێهرەگان هێرشی کردە سەر خەڵکەکەی. فەرمانڕەواکەی بەمشێوەیە گیانی خۆی کڕیەوە کەدارێکی ناو بەتاڵی هەڵگرت وپڕی کرد لەزێر و زیو و لەسەر بنەمای ئاشتی فارسەکان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست. دواتر ڕۆشتە شارستانێك کەپێیان دەوت کەرکویە. خەڵکەکەی بەئاشتی پێشوازیان لێکرد. دوای ئەوە بەرەو

زەرەنج بەرێکەوت و لەنزیك ئەوێ لەشارستانی روشت دابەزی و شەڕی لەگەڵ خەڵکەکەی کرد کەچەندین پیاو لەموسوڵمانەکان لەوێ کوژران. دواتر ئێرانیەکان شکەستیان خوارد و ئەو کوشتارێکی فراوانی لەناو ئەواندا بەرێخست. رەبیع ڕۆشتە ناشرود و دەستی بەسەردا گرت و دواتر ڕۆشتە شەرواد و ئەو ناوچەیشی گرت. لەوێوە ڕۆشتە زەرنج و شەڕی لەگەڵ خەڵکەکەی کرد. خەڵك لەبەرابەر ئەو خۆڕاگریان کرد بەلاّم ئەوانی تێکشکاند و گەمارۆی خستنەسەر. فەرمانڕەواکەی کەسی بۆ لای رەبیع رەوانە کرد تا پێشنیاری ئاشتی پێ بدات. داوای ئەمانی لێکرد تا خۆی بڕواتە لای. رەبیع ئەمانی دا. رەبیع لەسەر یەکێك لەجەستە بێ سەرەکان دانیشت و فەرمانی بەهاورێکانی دا ئەوانیش ئەو کارە بکەن. کاتێك فەرمانڕەواکە ئەمەی بینی لەو دیمەنە ترس لەدڵی نیشت و لەسەر بنەمای دانی هەزار کۆیلە ئاشتی لەگەڵ کرد بەو مەرجەی هەر کامیان جامێکی زێرینیان پێ بێت. موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شار. لەوێوە رۆشتە دۆڵی سەناوەرد. لەوێ تێپەڕی کرد و گەشتە دێهاتێك کەبەوتەی ئێرانیەکان شوێنی حەوانەوەی ئەسپەکانی رۆستەمی دەستان بو. خەڵك روبەروی بونەوە بەلاّم بەسەر ئەواندا سەرکەوت و دواتر گەڕایەوە زەرەنج و بۆ ماوەی یەك ساڵ لەوێ مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ لای کوڕی عامر. فەرمانداریێکی بۆ ئەو خەڵکە دەست نیشان کرد بەلاّم خەڵك دەریان کرد و لەقەلاّکاندا خۆیان حەشاردا.

فەرمانڕەوایی رەبیع یەك ساڵ و نیوی خایاند. ئەو چل هەزار کەسی بەئەسیری گرت. دەبیرەکەی حەسەنی بەصری بو. کوڕی عامر، عەبدولرەحمان کوڕی سەمرە کوڕی حەبیب کوڕی عەبدشەمسی وەك فەرمانڕەوایی سیستان دیاری کرد. ئەو بەرەو ئەو سەرزەمینە ڕۆشت و زەرنجی گەمارۆدا. فەرمانڕەواکەی لەسەر بنەمای دانی دوهەزار هەزار (دو ملیۆن) درەم و دو هەزار کۆیلە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست.

عەبدولرەحمان دەستی بەسەر هەمو ئەو ناوچانەدا گرت کە لەنێوان زەرند و کش لەپانتاییەکانی هندستانە و لەسەرزەمینی رەخج زاڵبو بەسەر ئەو سەرزەمینانەی لێرە تا داوونە. کاتێك گەشتە شاری داوون، گەمارۆی خستە سەر خەڵکی ئەو ناوچە لەکوێستانی زوز و دواتر لەگەڵ ئەوان ئاشتی بەست و ڕۆشتە لای زوز کەبتێکی زێرین بو. دو چاوەکەی لەیاقوت دروست کرابو. ئەو دەستی بتەکەی بڕی و دو یاقوتەکەی

هەڵگرت و بەفەرمانڕەواکەی وت: برۆ زێر و گەوهەرەکان هەڵبگرە. ویستم پێتی بسەلێنم کەبت سود و زیانی نیە. ئەو کابول و زابولی لەپارێزگای غەزنە گرت و گەڕایەوە زەرەنج و لەوێ ماوەیە تا ئاژاوە لەناو خەلافەتی عوسمان دروست بو. ئەمیر کوڕی ئەحمەری یەشکری وەك جێگری خۆی دەست نیشان کرد و گەڕایەوە. خەڵك ئەمیری یەشکریان دەرکرد و لەقەلاکاندا خۆیان حەشاردا. زیاد کوڕی ئەعجەم سەباردت بەم ئەمیرە وتی:

لولا امیر هلكت یشكر و یشكر هلكی علی كل حال

یانی: ئەگەر ئەمیر کوڕی ئەحمەر نەدەبو، یەشکر لەناو دەچو. بەڵی، هەرچی پێش بێت، یەشکریەکان بەرەو لەناوچون دەڕۆن.

## رو داوەکانیتر

لەم ساڵەدا ئەبودەردای ئەنساری لەبەدریەکان مرد. دەستەیەك دەڵێن: مردنی ئەو لەساڵی ٦٥٦/٣٢ زاییني رویدا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبوتەڵحەی ئەنساری مرد. ئەو لەبەدریەکان بو. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٥٢/٣٢ زاییندا مرد. دەستەیەکی دیکە دەڵێن: ساڵی ٥١ /٦٧١ زاییني مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبو ئەسیدی ساعدی مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٨٠/٦٠ زاییني کۆچی دوایی کرد. لەسەر بنەمای ئەم گێرانەوەیە، ئەو دوایین کەسی بەدری بو کەماڵئاوایی لەجیهان کرد.

## روداوەکانی ساڵی سی و دوەمی کۆچی (٦٥٤ زایینی)

دەڵێن: لەم ساڵەدا معاویە بەمەبەستی شەڕ و گرتنی قوستەنتەنیە ڕۆشتەدەر. هاوسەرەکەی عاتکە کچی قورەزە هاوڕێیەتی دەکرد. دەستەیەك ئەم ژنەیان بەفاختە ناو بردوە.

## سەرکەوتنی تورکەکان کوژرانی عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە

لەم ساڵەدا خەزەرەکان و تورکەکان بەسەر موسوڵماناندا سەرکەوتن.
هۆکارەکەی بەمشێوەیە کاتێك موسوڵمانان بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر ئەوان، ئەوانیان هەڵخراند و وتیان: ئێمە خەڵکانێك بوین کەس شیاوی بەرابەری لەگەڵ ئێمەی نەبو تا ئەوەی ئەم خەڵکانە دەرکەوتن و بارودۆخ گەشتۆتە شوێنێك ئێمە ناتوانین بەسەریاندا زاڵ ببین. یەکێك لەناو ئەواندا وتی: کەس لەوان نامرێت و تا ئێستا لەهیچ شەڕێکدا زیانیان بەرنەکەوتوە. پێشتر موسوڵمانەکان چەندین جار هێرشیان کردبو بەڵام کەس لەوان نەکوژرابو. لەبەر ئەمە گومانیان دەکرد موسوڵمانەکان نامرن. دەستەیەك وتیان: ئایا تاقی ناکەنەوە؟ لەدارستانەکان لەسەر ڕێگەی ئەوان کەمینیان کرد. چەند کەسێك لەموسوڵمانەکان لای ئەوانەوە تێپەڕین و ئەوان تیربارانیان کردن و هەمویان کوشتن. دواتر فەرماندەکانی خۆیان بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانەکان هاندا و ڕۆژێکیان دیاری کرد. ئەو کاتەی عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە لەدەروازەی باب دانرابو، عوسمان نامەی بۆنوسی بو: زۆرخۆری خەڵکی تەممەڵ کردوە، موسوڵمانان گیرۆدەی شەڕ مەکە دەترسم هەمویان لەناو بچن. عەبدولرەحمان لەمەبەستەکەی خۆی پاشگەز نەبویەوە و هێرشی کردە سەر بەلەنجەر. لەم کاتەدا تورکان و خەزەریەکان کۆببونەوە. ئەوان روبەروی موسوڵمانەکان بونەوە وشەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. عەبدولرەحمان کوژرا. تیشك پرژێنیان پێ دەوت. ئەمە ناوی شمشێرەکەی ئەوبو. خەڵکی بەلەنجەر جەستەی ئەویان هەڵگرت و خستیانە ناو تابوتێك و داوای باش بونەوە و باران و پیرۆزیان لێدەکرد. کاتێك کوژرا، موسوڵمانەکان شکەستیان خوارد وبون بەدوبەش: دەستەیەك بەرەو باب ڕۆشتن و چاویان بە سەلمان کوڕی رەبیعە برای عەبدولرەحمان

کەوت. ئەو سەعید کوڕی عاصی بەفەرمانی عوسمان بۆ هاوکاری موسوڵمانەکان ڕەوانە کردبو. کاتێك ئەویان بینی، ڕزگاریان بو. دەستەیەکیتر بەرەو گورگان وگیلان هەڵاتن. سەلمانی فارسی و ئەبوهورەیرە لەناو ئەواندا بون. لەو سوپایەدا، یەزد کوڕی معاویەی نەخەعی و عەلقەمە کوڕی قەیس و مێعزەدی شەیبانی و ئەبو مەفرەزی تەمیمی لەیەك خێوەتدا بون و عەمرۆ کوڕی عەتەبە و خالید کوڕی ڕەبیعە و خەڵخاڵ کوڕی زەری و قەرسەع لەخێوەتێکیتر. ئەوان لەناو سوپاکە دراوسێی یەکتر بون. قەرسەع بەردەوام دەیوت: چەندە جوانە درەوشانەوە خوێن لەسەر جل و بەرگ. عەمرۆ کوڕی عەتەبە عاباکەی ئەوی نیشان دەدا و دەیوت: چەندە جوانە درەوشانەوەی خوێنی سور لەسەر عابا سپیەکەی تۆ.

یەزد کوڕی معاویە نەخەعی لەخەودا بینی کەئاسکێکی زۆرجوانی بێ وێنەیان بۆ هێنا و لەپارچەیەکیان ئاڵاند و لەئارمگایەکی بێ وێنە و دەگمەن بەخاکیان سپارد کە سێ کەس بەئارامی لەسەر سەری دانیشتبون. کاتێك هەستا و هاورێ لەگەڵ خەڵکان دەستی بەشەڕ کرد، بەردێکی بەرکەوت کەسەری شکا و دەست بەجێ گیانی سپارد. دەڵێن: جلەکانی بەخوێن ڕازابویەوە. ئەویان بەهەمان شێوە کە لەخەودا بینیبوی، بەخاك سپارد.

مەعزەد بەعەلقەمەی وت: دەستارەکەی خۆت بەمن بدە تا سەری خۆمی پێ ببەستم. دەستارەکەی پێدا و ڕۆشتە سەردیوارێك کە لەوێوە بەردیان بۆ یەزید کوڕی معاویە نەخەعی هاویشتبو. دوژمنانی تیرباران کرد و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. بەردێك بەر سەری کەوت و سەری شکاند. هاورێکانی ئەویان هەڵگرت و لای یەزید بەخاکیان سپارد. عەلقەمە دەستارەکەی هەڵگرت بەڵام هەرچەند لەئاودا دەیشۆرد، سوری خوێنەکە پاك نەدەبویەوە. بەو دەستارەوە دەڕۆشتە نوێژی هەینی و دەیوت: ئەوەی بەم کارە ناچارم دەکات ئەوەیە کەخوێنی مەعزەدی پێوەیە. عەمرۆ کوڕی عەتەبە زیانی بەرکەوت و بریندار بو و عاباکەی خۆی بەهەمان شێوە بینی کەئارەزوی کردبو، دواتر کوژرا. بەڵام قەرسەع ئەوەندە شەڕی کرد تا جەستەی بەشمشێرەکان لەت لەت بو. ئەم هەواڵە بەعوسمان گەیشت. وتی: پەنا بەرخوا، خەڵکی کوفە لەیەك پچڕان، خوایە لەوان خۆش ببە و ئەم گیان بەخشینانەیان لێ وەربگرە.

عوسمان بۆ سەعید کوڕی عاصی نوسیبو تا سەلمان کوڕی رەبیعە بۆ ئەنجامدانی کاروباری شەڕ رەوانەی باب بکات. ئەو سەلمانی رەوانە کرد و لەسەر بنەمای ئەوەی وترا، روبەروی تێکشکاوەکان بویەوە. خوا ئەوانی لەسەر دەستی ئەو رزگار کرد. کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە کوژرا، سەعید سەلمان کوڕی رەبیعەی کردە فەرمانڕەوایی باب و حوزەیفە کوڕی یەمانی کردە فەرماندەی شەڕکەرانی کوفە. عوسمان خەڵکی شامی بەسەرکردایەتی حەبیب کوڕی موسلیمە بۆ هاوکاری ئەوان رەوانە کرد. سەلمان بەسەر ئەوان گەردن درێژی کرد و حەبیب بەم کارە رازی نەبو بەشێوەیەك خەڵکی شام وتیان: ئاهەنگی کوشتنی سەلمانمان کردوە.؟ خەڵکانی کوفە وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم کارە بکەن، حەبیب دەخەینە زیندان و ئەگەر پێداگری بکەن کوژراوەکان لەناو ئێمە و ئێوە فراوان دەبێت. ئەوس کوڕی مەغرا لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| فان تضربوا سمان نضرب حبیبکم | و ان ترحلوا نحو ابن عفان نرحل |
| و ان تقصطوا فالثغر ثغر امیرنا | و هذا امیر فی الکتاب مقبل |
| و نحن ولاة الامر کنا حماتة | لیالی نرمی کل ثغر و نعکل |

یانی: ئەگەر لەسەلمانی ئێمە بدەن، لەحەبیبی ئێوە دەدەین و ئەگەر بڕۆنەلای کوڕی عەفان، دەڕۆینە لای. ئەگەر بتانەوێت دادپەروەری جێبەجێ بکەن، ئەم سنورە، سنوری فەرمانڕەوایی ئێمەیە و ئەمە ئەو فەرماندەیە لەناو دەستە شەڕکەرەکان دەردەکەوێت. ئێمە خاوەنانی کار و پارێزەرانی بوین وئەمە لەو شەوانەدا بو کە لەسنورەکان دوژمنانمان تیرباران دەکرد و لەکوژراوەکان تەپۆڵکەمان دروست دەکرد.

حەبیب دەیویست هاوشێوەی فەرماندەکانی سوپا گەردن درێژی بەسەر فەرمانڕەوایی باب بکات. ئەمە یەکەم ناسازگاری بو لەناو خەڵکانی کوفە و شام پێشهات. حوزەیفە سێ جار بۆ شەڕ رۆشتەدەر و لەجاری سێیەم عوسمان کوژرا. هەواڵی کوژرانی عوسمان بەو گەیشت. حوزەیفە کوڕی یەمان وتی: ئەی خوایە، ناحەزان و بکوژانی ئەو نفرین بکە! ئەی خوایە هەندێ کات بەتوڕەیی قسەمان لەگەڵ دەکرد ورەخنەمان لێدەگرت وئەویش ئەم کارەی لەگەڵ ئێمە دەکرد. ئەمان بەم کارەیان، پەیژەیەکیان بۆ ئاژاوە و ناسازگاری بەرز کردەوە! خوایە ئەوان تەنیا بەزەبری شمشێر بمرێنە!

## مردنی ئەبوزەر

لەم ساڵەدا ئەبزەری غەفاری کۆچی دوایی کرد. بەکچەکەی خۆی وتبو: کچم، برۆرە سەر بەرزاییەك و بزانە کەس دەبینی. کچ وتی: نە. ئەبوزەر وتی: هێشتا کاتی مەرگی من نەهاتوە. دواتر بەکچەکەی وت و مەڕێکی سەربڕی و دروستی کرد. بەکچەکەی وت: کاتێك خەڵکان بێن و بیانەوێت من بەخاك بسپێرن، بزانە کەخەڵکانێکی چاکەخواز شایەتی مەرگی من دەبن. پێیان بڵێ: ئەبوزەر سوێندتان دەدات سوار چوارپێکانی خۆتان مەبن تا لەخواردنەکەی ئێمە بخۆن. کاتێك خواردنەکەی ئامادەبو، پێی وت: بزانە ئایا کەس دەبینیت. کچ وتی: بەڵێ، کاروانێك دەگات. ئەبوزەر وتی: من بەرەو کەعبە بسوڕێنە. کچ ئەو کارەی کرد. ئەبوزەر وتی: بەناوی خوا، لەگەڵ خوا، لەسەر دینی پێغەمبەر(ص). ئەوسا چاوەکانی بەست. کچ هاتەدەر و پێشوازی لەکاروانیەکان کرد و بەوانی وت: خوا لێتان خۆش بێت! وەرن ئەبوزەر بەخاك بسپێرن. وتیان: لەکوێیە؟ کچ باوکی خۆی نیشاندا. وتیان: بەڵێ، باشترین بەخشش لەلایەن خواوە! خوا ئێمەی بەم کارە ڕێزدار کرد. عەبدالله کوڕی مەسعود لەناو ئەواندا بو. گریا و وتی: ڕاستی دەوت پێغەمبەر(ص) کەئەبوزەر تەنیا دەمرێت و تەنیا هەڵدەستێتەوە. ئەویان شۆرد و کفنیان کرد و نوێژیان لەسەر خویند و بەخاکیان سپارد. دواتر کچەکەی بەوانی وت: ئەبوزەر سڵاوتان لێدەکات و دەڵێت: سوێندتان دەدەم سوار مەبن تا لەخواردنەکەی ئێمە نۆش بکەن. ئەوان خواردنەکەیان خوارد و بنەماڵەکەی ئەویان هەڵگرت و بردیانە مەککە و هەواڵی مردنەکەیان بەعوسماندا. ئەو کچی ئەبوزەری پەیوەستی بنەماڵەکەی خۆی کرد و وتی: خوا لەئەبوزەر خۆش بێت و لەمانەوەی لەرەبزە چاوبپۆشێت.

کاتێك کاروانیەکان گەیشتن، بۆنێکی خۆشیان لەو خێوەتە کرد. سەبارەت بەبۆنەکە پرسیاریان لەکچە کرد، وتی: کاتی مەرگی ئەبوزەر گەیشت. وتی: کەسەکان دەڕۆنە سەر سەری مردو، هەست بەبۆنێك دەکەن ناتوان خواردن بخۆن، بۆ ئەوان بۆنێك تێکەڵ بەئاو بکە و بیپرژێنە بەسەر خێوەتەکەدا.

ئەو چەند کەسەی لەبەخاك سپاردنەکەی ئامادە بون، ئەمانە بون: عەبدالله کوڕی مەسعود، ئەبو مەفرەز، بەکر کوڕی عەبدالله (ئەم دوانە هەردوکیان تەمیمی) ئەسوەد

کوڕی یەزید، عەلقەمە کوڕی قەیس، مالکی ئەشتەر، (ئەم دوانە هەردوکیان نەخەعی) حەڵحالی زەببی، حەرەس کوڕی سوەیدی تەمیمی، عەمرۆ کوڕی عەتەبەی سەلەمی، کوڕی رەبیعەی سەلەمی، ئەبورافعی مەزنی، سوەید کوڕی شەنبەی تەمیمی، زیاد کوڕی معاویە نەخەعی، براکەی قەرسەعی زەببی و براکەی مەعزەدی شەیبانی.
دەستەیەك دەڵێن: مردنی ئەو لەساڵی ٦٥٢/٣١ زایینی دابو.
دەستەیەك دەڵێن: عەبدالله کوڕی مەسعود بنەماڵەکەی ئەبوزەری لەگەڵ خۆیدا نەبرد بەڵکو ئەوانی لەوێ بەجێهێشت (چونکە لەخۆپەسەندی عوسمان دەترسا) تا ئەوەی لەمەککە ڕۆشتە لای عوسمان و لەمردنی ئەبوزەر ئاگاداری کردەوە. عوسمان کەسی بەدوای بنەماڵەکەیدا نارد و ئەوانی بۆ مەدینە هێنا.

## بزوتنەوەی قارن

قارن سوپایەکی گەورەی لەپانتاییەکانی تەبسین وخەڵکی بادغیس و هەرات و کوێستان کۆکردەوە و لەگەڵ چل هەزار پیاوی شەرکەر دەرکەوت. قەیس بە کوری خازمی وت: چی دەبینیت؟ وتی: گومان دەکەم شارەکە چۆڵ بکەیت چونکە فەرماندار منم و لەکوری عامر فەرمانم پێدراوە هەرکاتێك شەڕی خوراسان دەست پێبکات، من فەرماندە بم. نوسراوێکی دەرهێنا کەبەدرۆ دروستی کردبو. قەیس نەیخواست ئاژاوە بنێتەوە و لەبەر ئەمە سەرزەمینەکانی بەو سپارد و بەرەو لای کوری عامر بەرێکەوت. کوری عامر سەرکۆنەی کرد و وتی: شارەکانت وێران کرد و بەجێت هێشتن. قەیس وتی: فەرمانێکی لەتۆ نیشاندام. دەڵێت: کوری خازم هاورێ لەگەڵ چل هەزار پیاوی شەرکەر روبەروی قارن بویەوە و فەرمانی بەخەڵك دا رۆن لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن. کاتێك گەیشتە نزیکی قارن، فەرمانی بەخەڵکدا تا هەر کەسێك پارچە یا لۆکە لەنوکی رمەکەی خۆی بئاڵێنێت و بەرۆن چەوری بکات. دواتر تا کاتی شەو پێشرەوی کرد. پێشەنگەکانی ئەو شەشسەد پیاوی شەرکەر بون. گەیشتن و ئەو بەدوای ئەواندا بەرێکەوت. فەرمانی بەخەڵکدا تا نوکی رمەکان ئاگر بدەن. پێشەنگەکانی ئەو نیوە شەو گەشتنە سوپاکەی قارن و هێرشیان کردنەسەر. خەڵك ئارام خەوتبون و ئاسودە دەژیان، بەترسەوە لەخەو هەستان. کوری خازم لەوان نزیك بویەوە. سوپاکەی قارن بڵێسەکانی ئاگریان بینی کەبۆ سەر و خوار و ئەم لاولادا دەڕۆن. لەم دیمەنە ترسان وپێشەنگانی کوری خازم سەرقاڵی

شەر كردن لەگەڵ ئەوان بون. دواتر كوری خازم و موسوڵمانان هێرشیان كردە سەریان و قارن كوژرا. شۆڕشگێران شكەستیان خوارد و موسوڵمانان شوێنیان كەوتن و بەهەر شێوەیەك مەبەستیان كرد ئەوانیان كوشتار كرد و ئەسیری زۆریان لێ گرتن. كوری خازم هەواڵی سەركەوتنەكەی خۆی بۆ كوری عامر نوسی. ئەو شادمان بو و كوری خازمی كردە فەرمانڕەوایی خوراسان. فەرمانداری خوراسان بو تا شەری وشتر كۆتایی پێهات. دواتر بەرەو بەسرە ڕۆیشت و لەشەری كوری حەزرەمی ئامادە بو و لەدار سەنبیل هاورێیەتی دەكرد.

دەستەیەك دەڵێن كاتێك قارن سوپاكەی كۆكردەوە، قەیس كوری هەیسەم لەگەڵ عەبدالله كوری خازم راوێژی كرد. كوری خازم وتی: گومانم وایە تۆ ناتوانیت شەری ئەم سوپایە بكەیت. خۆت برۆ لای كوری عامر و ئاگاداری بكەرەوە كەدوژمنان فراوانن. ئێمە لەقەلاّكاندا دەمێنینەوە و ئەوان سەرقاڵ دەكەین تا هێزەكانی ئێوە بۆ هاوكاریمان بگەن. قەیس ڕۆشت. كاتێك دوركەوتەوە، كوری خازم فەرمانی دەرهێنا و وتی: كوری عامر منی وەك فەرمانداری خوراسان دیاری كردوە. ئەو ڕوبەروی قارن بویەوە و بەسەریدا سەركەوت و هەواڵی سەركەوتنی خۆی بۆ كوری عامر نوسی. كوری عامر فەرمانرەوایی خوراسانی پێ بەخشی. خەڵكانی بەسرە درێژەیان بەشەڕەكانی خۆیاندا لەگەڵ ئەو كەسانەی هێشتا پەیمانی ئاشتیان نەبەستبو. هەر كات دەگەڕانەوە، چوار هەزار پیاوی شەڕكەریان وەك هێزی پشتیوان لەپشت سەری خۆیان بەجێ دەهێشت.

## روداوەكانیتر

لەم ساڵەدا عەباس مامی پێغەمبەر(ص) لەهەشتا و هەشت ساڵیدا مرد. ئەو سێ ساڵ زوتر لەپێغەمبەر(ص) لەدایك بو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان كوڕی عەوف لەتەمەنی حەفتا وپێنج ساڵیدا مرد.

عەبدالله كوڕی مەسعودیش لەم ساڵەدا مرد و عەمار كوڕی یاسر یا عوسمان كوڕی عەفان نوێژی لەسەر خوێند.

عەبدالله كوڕی زەید كوڕی عەبد ڕەبە كەچۆنیەتی بانگدانی (لەجیهانی نهێنی) فێر ببو، لەم ساڵەدا كۆچی دوایی كرد.

## روداوەکانی ساڵی سی و سێیەمی کۆچی (٦٥٤ زایینی)

لەم ساڵەدا شەڕی معاویە لە ( قەڵای خاتوون) لەپانتاییەکانی مەڵتیە (مالاتایاوی) لەسەرزەمینی رۆم رویدا. هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی سەعد بۆ جاری دوەم لەئەفریقیە شەڕی کرد چونکە خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی خۆیان شکاند. هەروەها لەم ساڵەدا ئەحنەف هێرشی کردە سەر خوراسان و دەستی بەسەر دومەرودا گرت و کوڕی عامر سوپای بۆ نەیشابور برد و گرتی.

ئەمە بەوتەی دەستەیەك لەمێژوونوسانە و پێشتر ئاماژەمان پێدا. بەوتەی دەستەیەك گرتنی قوبروس لەم ساڵەدا بو. دەستەیەك دەڵێن: گرتنەکەی لەساڵی ٦٤٧/٢٦ زایینی رویدا و کاتێك ساڵی ٦٥٣/٣٢ زایینی گەیشت، خەڵکەکەی کەشتی شەڕکەریان بەرۆمیەکان دا و ئەوانیان لەشەڕی دەریایی هاوکاری کرد. معاویە لەساڵی ٦٥٤/٣٣ زایینی شەڕی لەگەڵ کردن و بەزۆر دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت و کوشتار و تالآنی کرد. زۆری لێ ئەسیر کردن و دواتر پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و دوانزە هەزار کەسی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد کەچەندین مزگەوتیان دروست کرد و بناغەی شارێکیان داڕشت. دەستەیەك دەڵێن: دوەم شەڕی ئەو لەساڵی٦٥٥/٣٥ /٦٥٦ زایینی رویدا.

## رەوانە کردنی کوفیەکان بۆ شام

لەم ساڵەدا عوسمان چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفەی رەوانەی شام کرد. هۆکارەکەی ئەوەبو کاتێك عوسمان سەعید کوڕی عاصی لەکوفە دانا( کاتێك خەڵك شایەتیان دا کەفەرمانڕەواکەی یانی وەلید شەراب دەخوات) فەرمانی پێدا وەلید بۆ لای ئەو رەوانە بکات. سەعید هاتە کوفە و وەلیدی رەوانە کرد و کورسی وتاردانی مزگەوتی شۆرد. خەڵکانێك لەبەنی ئومەییە رێگەی ئەم کارەیان لێگرت. بەلآم گوێی لەوتەکانی ئەوان نەگرت. سەعید گەورەکانی خەڵك و شەڕکەرانی قادسیە و قورئان خوێنەکانی کوفەی لەدەوری خۆی کۆکردەوە. ئەو کاتەی بەتەنیا دادەنیشت، ئەم کەسانە لەگەڵیدا بون. کاتێك دەهاتەدەر، هەمو خەڵك دەهاتنە سەردانی. رۆژێك کەئەوان سەرقاڵی گفتوگۆ بون، حوبەیش کوڕی فولآنی ئەسەدی وتی: چەندە پیاوێکی بەخشندەیە تەڵحە کوڕی

عوبەیدالله! سەعید وتی: هەر کەس (نشاستەیەکی) ( گوندێکی ئاوەدان و بەداهاتی گەورەی کوفە) وەك ئەوی هەبێت، بێ گومان دەبێت بەخشندە بێت و شیاوە بەمشێوە بێت. سوێند بەخوا ئەگەر دێهاتێکی لەم چەشنەم دەبو، لەگەڵ ئێوە ژیانێکی ئاسودەم دەست پێدەکرد. عەبدولرەحمان کوڕی حوبەیش کەکوڕێکی تازەپێگەیشتو بو، وتی: خۆزگە هەمو ئەم کەنار دەریایە ملکی تۆ دەبو! ئەمە ئاوەدانیەکی گەورە لەسەر کەنارەکانی فورات لەنزیك کوفە بو کەپێشتر ملکی تایبەتی خوسرەوانی ئێران بو. کەسانێك لەناو خەڵك وتیان: خوا دەمت بشکێنێت! سوێند بەخوا مەبەستی کوشتنی تۆمان کرد. باوکی وتی: کوڕێکی تازە پێگەیشتوە، ئازاری مەدەن. وتیان: سەراسەری شارەکەی ئێمە بۆ ئەم پیاوە ئارەزو دەکات. مالکی ئەشتەر و جەندەب و کوڕی زی حەنکە و سەعسەعە و کوڕی کەوا و کومەیل و عومەیر کوڕی زابی ئاهەنگی کوشتنی ئەو کوڕەیان کرد و باوکی پارێزگاری لێکرد. ئەوەندەیان لەو دوانەدا تا لەهۆش چون. سەعید بەردەوام ئەوانی سوێند دەدا و ئەوان رازی نەبون تا ڕقی دڵی خۆیان لەو دوانە وەرگرت. بەنی ئەسەد ئەم هەواڵەیان بیست و لەگەڵ تولێحە هاتن وگەمارۆی کۆشکیاندا. هۆزەکان سوار بون و پەنایان بۆ سەعید برد. سەعید ڕۆشتە لای خەڵك و وتی: ئەی خەڵکینە، چەندین کەس پێکەوە شەڕیان کرد و خوا دوای ئەوە ئارامشی نارد. ئەوانی بەرێکرد و گەڕانەوە. دوپیاوەکە هاتنە هۆش و وتیان: دارودەستەی تۆ ئێمەیان کوشت. سەعید وتی: نیتر هیچ کات نایێنە لای من. دەمتان دابخەن و دوبەرەکی لەناو خەڵکدا دروست مەکەن. ئەو کارەیان کرد. ئەو چەند کەسەیتر خانەنشین بون و زمانیان بۆ رەخنە گرتن لەعوسمان کردەوە.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکارەکەی ئەوە بو گەورەکانی کوفە لای سەعید بەشەونشینی سەرقاڵ دەبون و ئەم کەسانە لەناو ئەواندا دەبینرا: مالك کوڕی کەعبی ئەرحەبی، ئەسوەد کوڕی یەزید، عەلقەمە کوڕی قەیس (ئەم دوانە نەخەعی)، مالکی ئەشتەر و کەسانیتر. جارێك سەعید وتی: سواد باخی قوڕەیشیەکانە. ئەشتەر وتی: ئایا گومان دەکەیت سوادێك کەخوا لەهێزی شمشێرەکانمان بەئێمەی بەخشیوە، باخی تۆ و کەسانی تۆیە؟ خەڵك هاورێیەتیان کرد. عەبدولرەحمانی ئەسەدی فەرماندەی پارێزەرانی سەعید وتی: ئایا لەبەرابەر فەرمانڕەوا زمان درێژی دەکەن. ئەوو قسەی ناشیرینی

بەوان وت. ئەشتەر وتی: ئەمە کێیە؟ ڕێگە مەدەن رابکات. خەڵك پەلاماریان دا وئەوەندەیان لێدا تا لەهۆش خۆی چو. دواتر قاچیان راکێشا و بردیانەدەر، ئاویان بەسەر و روخساریدا کرد و هاتە هۆش. وتی: کەسانێك منیان کوشت کەخۆم هەڵمبژاردبون. سەعید وتی: سوێند بەخوا ئیتر هیچ کەس بۆ شەونشینی لای من دانانیشێت. ئەوان لەکۆڕەکانی خۆیان دادەنیشتن و جوێنیان بەعوسمان و سەعید دەدا. خەڵك لەدەوریان کۆبونەوە و ژمارەیان زیادی کرد. سەعید و گەورەکانی کوفە نامەیان بۆعوسمان نوسی و خوازیاری دەرکردنی ئەوان بون. عوسمان نامەی بۆ نوسین و فەرمانی پێدان بڕۆن بۆ لای معاویە. نامەی بۆ معاویە نوسی: کەسانێك لەئارادان بۆ ئاژاوە نانەوە ئافرێنراون، ئاگات لەوان بێت و ڕێگریان بکە. ئەگەر بینیت دەیانەوێت بگەڕێنەوە، لەوان خۆش ببە و ئەگەر بێزاریان کردی، رەوانەی لای منیان بکە.

کاتێك هاتنە لای معاویە، ئەوانی لەکەنیسەی مریەم دابەزاند و بەفەرمانی عوسمان هەمو سامانەکانی عێراقی بۆ رەوانە کردن. لەگەڵ ئەوان ئێوارێ و نیمەڕۆی کرد. جارێك بەوانی وت: ئێوە خەڵکانێکن لەعەرەب کەرم و زمانی تیژتان هەیە. لەپیرۆزی ئیسلامەوە بو گەورەییتان پێبڕا و بونە فەرمانڕەوایی خەڵکانی جیهان و میراتەکانی ئەوانتان هەڵگرت. هەواڵیان بەمنداوە زمانتان بۆ سەرکۆنە کردنی قوڕەیشیەکان کردۆتەوە و ئەوانتان رەنجاندوە. ئەگەر قوڕەیش نەدەبو، ئێوە خەڵکانێکی ریسوا و پەست دەبون. ڕێبەرەکانتان قەڵغانەکانی ئێومن، لەقەڵغانەکان دورمەکەونەوە و بلاوەی لێمەکەن. ڕێبەرەکانتان بەرگەی زەحمەتەکانی ئێوە دەگرن و رەنج و خەرجی ژیانی ئێوەیان لەئەستۆدایە. سوێند بەخوا یا واز لەکارەکانتان دەهێنن یا خوا گرفتاری کەسێکتان دەکات کەژەهرێکی گیان ستێنتان پێ دەچێژێت و توانایی بەرگە گرتنتان نیە. ئەوسا ئێوە دەبنە شەریك لەگرفتار کردنی خەڵکان بە بەدبەختی لەژیان و دوای مەرگی خۆتان.

پیاوێك لەناو ئەوان (صەعصەعە کوڕی صوحان) وتی: ئەوەی سەبارەت بەقوڕەیشیەکان ئاماژەت پێدا، دەبێت بزانیت ئەوان زۆرترین خەڵکانی عەرەب و پارێزراوترینی ئەوان نەبون کەئێمە لەوان دەترسێنیت. بەلام ئەوەی سەبارەت بەقەڵغان باست کرد، ئاگادار بە قەڵغان کاتێك دڕا، بەرەو لای ئێمە دێت.

معاویە وتی: ئێستاکە ئێوەم ناسی و تێگەیشتم ئەوەی ئێوەی بەم کارانە ناچار کردوە، نەبونی ئاوزە. تۆ کەخۆت بەوتاردەری ئەوان دەزانیت، لەگەڵ خۆت بێگانەیت. من شکۆی ئیسلام لەبەرچاوی تۆدا گەورە دەکەم و تۆ رۆژگاری جاهلی بۆ من باس دەکەیت.خوا ئەو خەڵکانە ریسوا بکات کەئێوەیان بەرێز کرد. لەمنی ببیستن و گوێ لەقسەکانی من بگرن هەرچەند گومانی ئەوەم نیە تێبگەن. قورەیشیەکان لەرۆژگاری جاهلی وئیسلام تەنیا بەفەرمانی خوا رێزدار بون. نەزۆرترینی خەڵکی عەرەب بون و نەبەهێزترین و خاوەن شکۆترینی ئەوان بەڵام بەرزترین پێگەیان بو و رەسەنترین رەچەڵەك و نەژاد لەگەڵ زیاترین جوامێری. لەرۆژگاری جاهلی کەخەڵك یەکیان دەکوشت و دەخوارد، تەنیا بەهاوکاری خوا پارێزران. خوا ئەوانی لەنزیك بارەگاکەی پاراست کەخەڵکانیتر لەوێ دەرفێندران. هیچ عەرەب و عەجەم و سور و رەشێك دەناسن کەرۆژگار سەرزەمینەکەی ئەوی لەناو نەبردبێت و رێزی ئەوی نەزراندبێت؟ تەنیا قورەیشیەکان بون کەهەر کەس ئاهەنگی ئەوانی کرد، خوا روخساری ژاکاندن و لوتیانی لەزەویدا. سەرئەنجام ئەمە مەبەستی خوا بو کەئەوانەی رێزیان لەدینەکەی گرتبو و شوێنی کەوتبون، لەریسوایی ئەم دنیا و ئاخرشەری ئەو دونیا رزگار بکات. خوا بۆ ئەم کارە باشترین ئافرێنراوەکانی خۆی هەڵبژارد و هاورێیانێکی بۆ دیاری کرد کەقورەیشیەکان باشترینیان بون. دواتر ئەم پاشایەتیەی بۆ ئەوان بەهێز کرد و ئەم فەرمانرەواییەی بەوان بەخشی کەتەنیا بۆ ئەوان شیاوە نەکەسیتر. ئەو کاتەی ناباوەر بون، خوا دەیپاراستن، ئایا گومان دەکەیت ئێستا کەباوەردارن، پارێزگاریان لێ ناکات؟ هاوار و تف لەتۆ و هاورێکانت!

بەڵام تۆئەی صەعصەعە! شارەکەی تۆ خراپترینی شارەکانە! ماڵەکانی لەهەموان وێرانتر، دۆڵەکانی لەهەموی قوڵتر، زیانەکەی لەهەمو شوێنێك زیاتر ودراوسێکانی لەهەموان ریسواتر! هیچ گەورە یا بچوکێك لەوێ نەمایەوە مەگەر ئەوەی جوێنیان پێدا. خەڵکەکەی تۆ پەسترینی پەیوەست بوەکان و قێزەونترینی ئاوازەکانیان بوە. لەناو خەڵکدا نەناسراو بون و ئێوە لەسەر سنور بون و بەکرێگیراوی ئێرانیەکان تا بانگێشتەکەی پێغەمبەر(ص) بەئێوە گەیشت. تۆ لەبەحرەین نەمایتەوە تا لەبانگێشتەکەی پێغەمبەر(ص) بەشدار بیت. لەبەر ئەمە تۆ خراپترین کەس لەناو

خەڵکەکەی خۆتیت. تا ئەوەی کاتێك ئیسلام تۆی بەرز کردەوە و تێکەڵ بەخەڵك و رێزداری کردیت، لەشوێنی خۆت قوت بویتەوە و خوازیاری نەمانی ئایینی خوا بویت و بەرەو ریسوایی ڕۆشتیت. ئەم کارە زیان لەقورەیشیەکان نادات و پێگەی ئەوان دانابەزێنێت و نابێتە رێگر لەئەنجامدانی ئەوەی لەسەریان پێویستە. دێو لەئێوە بێ ئاگا نیە. ئەو ئێوەی بۆ زیان گەیاندن هەڵبژاردوە و لەبەر ئەمە دەتوانن خەڵکان فریو بدەن. ئێوە بەرەو لەناوچون دەبات. هیچ کات کارێکی خراپە ئەنجام نادەن مەگەر ئەوەی خوا خراپتر بەسەر ئێوەدا دابەزێنێت. معاویە هەستا. ترس کەوتە گیانیان. دواتر گەڕایەوە لای ئەوان و وتی: فەرمان بەئێوە دەدەم. بۆ هەر شوێنێك پێتان خۆشە بڕۆن چونکە خوا نەسود لەئێوە بەکەس دەگەیێنێت نەزیان چونکە ئێوە شیاوی سود و زیان نین. ئەگەر ئاسایش و رزگاریتان دەوێت، هاورێیەتی خەڵك بکەن ورێگە مەدەن بەخشش ببێتە هۆکاری سەرخۆشی و تەممەڵی ئێوە چونکە ئەمە خو و عادەتی چاکەکاران نیە. بۆ هەر شوێنێك دەتانەوێت بڕۆن چونکە سەبارەت بەئێوە نامە بۆ سەروەری باوەڕداران دەنوسم.

کاتێك رۆشتنەدەر، ئەوانی بانگ کرد و پێی وتن: جارێکیتر پێتان دەڵێم پێغەمبەر(ص)ی خوا پاك بو، منی دانا و منی بۆ ئەم کارە دیاری کرد. دواتر ئەبوبەکر هاتەسەر کار و رێز لەمن گرت، عومەر بو بەخەلیفە ومنی دانا و عوسمان منی کردە فەرمانڕەوا. کەس منی بۆ کارێك دیاری نەکرد مەگەر ئەوەی لێم رەزامەند بو. پێغەمبەر(ص) بۆ بەرێوبردنی کاروباری وڵات کەسانی دیار و بەتوانای لەناو موسوڵمانەکان هەڵدەبژارد. خوا هەم تۆڵە دەستێنێتەوە و هەم رق هەڵدەگرێت لەگەڵ ئەو کەسانەی بەلارێدا دەڕۆن و فریو بەکار دەبەن. کارە نەشیاوەکان ئەنجام مەدەن چونکە دەبێتە هۆی ئاشکرابونی لەلایەن خۆتانەوە. خوا ئێوە ناهێڵێتەوە مەگەر ئەوەی تاقیتان بکاتەوە و ناخی ئێوە ئاشکرا بکات.

معاویە هەواڵی بۆ عوسمان نوسی: خەڵکانێك هاتونەتە لای من نەئاوزیان هەیە و نەدین. دادپەروەری ئەوانی بێزار کردوە. هیچ کارێك بۆ رەزامەندی خوا ئەنجام نادەن و هیچ وتەیەکی بەمانا ناهێننە سەرزمان. مەبەستی ئەوان ئاژاوە نانەوە و دەست گرتنی بەسەر سامانی خەڵکە ئەمان دراوەکانە. خوا ئەوان گرفتار دەکات و تاقیان دەکاتەوە و

دواتر ریسوا و سوکیان دەکات. کەسانێك نین بتوانن زیان بگەیێنن مەگەر ئەو کاتەی یەك بگرن. سەعید و هاورێکانی لەوان دوربخەردوە چونکە تەنیا دەستەیەکی ئاژاوەچین.

ئەوان لەدەمشق هاتنەدەر و بەخۆیان وت: ناگەڕێینەوە بۆ کوفە تا سەرکۆنەمان بکەن، دەبێت ئاهەنگی جەزیرە بکەین. عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید فەرمانڕەوایی حمص لەهاتنیان ئاگادار بویەوە، ئەوانی بانگ کرد و وتی: ئەی بەڵێن داوەکان بەدێو، بۆ شوێنێکی گەورە و بەربلاَو بەخێر نەهاتن. دێو سەرکوتکراو پاشەکشێی کرد و ئێوە هێشتا لەجم و جوڵدان. خوا عەبدولرەحمان زیانبار بکات ئەگەر ئێوە تەمێ نەکات. ئەی ئەو کەسانەی نازانم عەرەبن یا عەجەم، ئەو قسانە لەگەڵ من مەکەن کە بەمعاویەتان وت. من کوڕی خالید کوڕی وەلیدم، دوای ئەوەی تاقی کردنەکان ئەویان بەئەزمون کردبو، ئەو کەسەی هەڵگەراوەکان لەدینی سەرکوت کرد! ئەی صەعصەعە، ئەگەر ببیستم یەکێك لەهاورێکانی من لوتی تۆ بشکێنێت و دواتر هاوکاریت بکات، تۆ بۆ شوێنێکی زۆر دور دوردەخەمەوە! یەك مانگ ئەوانی هێشتەوە و هەر جارێك سوار دەبو ئەوانی بەپیادە بەدوای خۆیدا دەبرد. کوڕی صەعصەعە دەڕۆشتە لای وپێی دەوت: ئەی کوڕی حوتەیئە، ئایا گومان دەکەیت کەسێك کە بەچاکە نەگەڕێتەوە سەر رێگای راست، دەتوانرێت بەخراپە بگەڕێتەوە سەر رێگای راست؟ بۆ ئەو قسانە لەگەڵ من ناکەیت کەبیستومە لەگەڵ سەعید و معاویە وتوتە؟ ئەوان بەردەوام دەیانوت: سوێند بەخوا دەگەڕێینەوە سەررێگای راست، لەئێمە خۆش ببە تا خوا لەتۆ خۆش ببێت. ئەوەندە پاڕانەوە تا وتی: خوا لەئێوە خۆش بو. ئەشتەری بۆ لای عوسمان رەوانە کرد کەڕۆشتە لای. عوسمان وتی: دەتەوێت بۆ کوێ بڕۆیت؟ وتی: دەمەوێت لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی خالید دا بم. عوسمان وتی: هەرچی دڵت دەخوازێت. ئەشتەر رۆشتە لای عەبدولرەحمان.

دەستەیەکیتر ئاماژەیان بەم گێڕانەوەیەدا و زیادیان کردوە کاتێك معاویە دوایین شەو بۆ لای ئەوان گەڕایەوە و ئامۆژگاری کردن، وتی: سوێند بەخوا فەرمانی کارێك بەئێوە نادەم مەگەر ئەوەی لەخۆم و بنەماڵەکەم دست پێبکەم. قوڕەیشیەکان دەزانن ئەبوسوفیان بەرێزترینی ئەوان و زادەی رێزدارترینیان بو جیاواز لەوەی تایبەت کرا

بەپێغەمبەر(ص) و ئەوی هەڵبژارد. گومان وایە ئەگەر ئەبوسوفیان هەمو خەڵکانی دەهێنایە دونیا، هەمویان فرەزانەکان دەبون. صەعصەعە وتی: درۆت کرد! خەڵکان لەکەسێکی زۆر رێزدارتر لەئەبوسوفیان هاتونەتە دونیا، کەسێك کەخوا ئەوی لەسەر دەستی خۆی ئافراند و لەرۆحی خۆی گیانی بەبەردا کرد و فەرمانی بەفریشتەکان دا نوێژی بۆ ببەن. لەگەڵ ئەمەیشدا، لەناو ئەوان چاکەکار و خراپەکار و نەزان و بیرمەند تێکەڵاو بون. معاویە ئەو شەوە لای ئەوان رۆیشت و دوایین شەو بۆ لای ئەوان گەڕایەوە و ماوەیەکی درێژ لەگەڵ ئەوان گفتوگۆی کرد. وتی: ئەی خەڵکینە، یا وتارێکی باش بەمن بڵێن یا بێدەنگ بن و ئەندێشە بکەن و بیر لەکارێك بکەنەوە کەسود بەئێوە و هەمو موسوڵمانان دەگەیەنێت. صەعصەعە وتی: تۆ پیاوی ئەم کارە نیت و بەهای ئەوەت نیە لەبەهای نافەرمانی کردن لەخوا فەرمانبرداری تۆ بکەین. معاویە وتی: مەگەر پێش هەر قسەیەك داوای فەرمانبردنی خوا و پێغەمبەر(ص)م لەئێوە نەکردوە؟ ئەموت بۆ لای خوا بگەڕێنە و رشتەکانی دینداری مەپچڕێنن؟ وتیان: فەرمانت بۆ دوبەرەکی و نافەرمانی کردنی پێغەمبەر(ص) بەئێمەدا. معاویە وتی: هەرئێستا فەرمان بەئێوە دەدەم و ئەگەر بەو شێوە فەرمانم دابێت، تۆبە دەکەم و فەرمانتان پێدەکەم لەخوا بترسن و فەرمانبرداری خوا وپێغەمبەر(ص)ەکەی بن و تێکەڵ بەخەڵك بن و رێبەرانی خۆتان بەگەورە بزانن و بۆ چاکەکاریەکان رێنوێنیان بکەن. صەعصەعە وتی: بەم پێیە، فەرمان بەتۆدەدەم خۆت لەسەر کار لابەریت چونکە کەسانی زۆر لەناو موسوڵمانان هەن لەتۆ بۆ ئەم کارە شیاوترن، ئەو کەسانەی باوکیان پێشینەیەکی باشتری لەباوکی تۆ لەئیسلامدا هەیە و خۆیشیان لەتۆ لەپێشترن. معاویە وتی: سوێند بەخوا من لەئیسلام پێشینەیەکەم هەیە و کەسانی باشتر لەمن بونیان هەیە بەڵام لەئێستادا کەس لەمن بە تواناتر بۆ ئەم کارە نیە. عومەر هیچ کات چاوپۆشی لەمن بۆ کەسیتر و لەکەسیتر بۆ من نەدەکرد. کارێکم نەکردوە بەتاوانەکەی دەست لەفەرمانڕەوایی هەڵگرم. ئەگەر سەروەری باوەڕداران کارێکی خراپی لەمن دەبینی، فەرمانی بەمن دەدا لەهاوکاری کردنی ئەو خۆم بەدور بگرم. ئێستا ئارامم چونکە ئەم کردار و ئاکارانە هاوشێوەی ئەوەیە کەدێو دەیخوازێت و فەرمانی ئەنجامدانی دەدات. سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر کاروبارەکان لەسەر بنەمای ئارەزوەکانی

ئێوە بسورێت، ئیسلام بۆ یەك رۆژیش ناتوانێت خۆڕاگری بكات. چاكە بكە و چاكەكاری بكەنە پیشە، خواوەند تاقی كردنەوەی سەخت و دژواری هەیە. من لەئێوە دەترسم بۆ فەرمانبردنی دێو و نافەرمانی خوا یەك بگرن و ئەم كارە لەم دنیا و لەو دنیا گرفتاری گێژاوی ریسواییتان بكات. ئەوان پەلاماریان دا، سەر و ریشیان گرت و رایانكێشا. معاویە وتی: ئاگادار بن، ئێرە سەرزەمینی كوفە نیە، ئەگەر خەڵكانی شام بزانن چیتان لەگەڵ من كردوە، دەستتان لێ هەڵناگرن و هەموتان دەكوژن. سوێند بەگیانی خوم هەمو ئاكارەكانی ئێوە هاوشێوەی یەكە.

دواتر ئەوانی بەجێهێشت ونامەیەكی هاوشێوەی نامەی پێش وتراو بۆ عوسمان نوسی. عوسمان نامەی بۆ نوسی و فەرمانیدا ئەوان بۆ لای سەعید كوڕی عاص لەكوفە بگەڕێنێتەوە. معاویە ئەوانی گەڕاندەوە و ئەوان زمانیان بۆ ستەمكاری و سەركۆنەكردن كردەوە., سەعید لەوان بێزار و گلەیی بردە لای عوسمان. عوسمان فەرمانیدا ئەوان بۆ لای عەبدولرەحمان كوڕی خالید لەحمص رەوانە بكات. رەوانەی كردن. عەبدولرەحمان ئەوانی نیشتەجێ كرد و بژێویەكی دیاری كراوی بۆ بڕینەوە. ئەم كەسانە لەناویاندا بون: مالكی ئەشتەر، سابت كوڕی قەیسی هەمەدانی، كومەیل كوڕی زیاد، زەید كوڕی صوحان، براكەی صەعصەعە كوڕی صوحان، جەندەب كوڕی زوهەیری غامدی، جەندەب كوڕی كەعبی ئەزدی، عوروە كوڕی جەعد، عەمرۆ كوڕی حەمەقی خوزاعی و عەبدالله كوڕی كەوا .

دەڵێن: معاویە سەبارەت بەخۆی لە كوڕی كەوا پرسیاری كرد. وتی: تۆ نوقمی چاكەكاریت و لەوەرگای زۆرت هەیە، بێ بیركردنەوە قسە دەكەیت و باشتریت قسە دێنیتە سەرزمان، قولایی تۆ زۆر ونەوەی بەسەر تۆدا زاڵە، خۆڕاگری و فرەزانیە، بەشێك لەبەشەكانی خاكی ئیسلام و سنورێكی مەترسیدار و گرانبایی دەپارێزێت. معاویە وتی: من لەخەڵكانی تازە هاتوی شارەكان ئاگادار بكەرەوە چونكە فرەزانترینی كەسەكان لەناو خەڵكەكەی خۆتدایت. كوڕی كەوا وتی: خەڵكانی مەدینە خراپترینی كەسەكانن لەلایەنگیری كردن لەخراپە و ناتەوانترینی ئەوان، كوفیەكان بەكۆمەڵ دەڕۆنە سەر سفرە و پرژ وبلاو لێی دێنەدەر. میسریەكان خێراتر لەهەموان رو لەزیان دەكەن و زۆر خێرا پەشیمان دەبنەوە. خەڵكانی شام زیاتر لەهەموان دڵ

بەرێنیشاندەرەکەیان دەبەستن و بەئاسانی پشت دەکەنە خراپە خوازەکان و نافەرمانی دەکەن.

## رەوانە کردنی خەڵکانی بەصرە بۆ شام

کاتێك سێ ساڵ بەسەر فەرمانڕەوایەتی عەبدالله کوڕی عامر تێپەڕی کرد، بیستی کە لەهۆزی عەبدولقەیس پیاوێك بەسەر دەبات کەڕۆشتە لای حوکەیم کوڕی جەبەلەی عەبدی. ئەو عەبدالله کوڕی سەبئ ناسراو بەناوی (ابن السودا ) بو. ئەم پیاوە بو ڕۆشتبوە لای حوکەیم. چەند کەسێك لەدەوری کۆبونەوە و کوڕی سەودا قسەکانی خۆی کرد بەلاّم بەراشکاوی نەیوت و ئەوان پێی رازی بون. کوڕی عامر کەسێکی ناردە لای و پرسی: کێیت؟ وتی: پیاوێك لەخەڵکانی خاوەن کتێب کەباوەڕم بەئایینی ئیسلام هێناوە و لای تۆ ئارامم گرتوە. کوڕی عامر وتی: ئەمە ئەو هەواڵە نیە بەمن گەیشتوە. لەشار بڕۆرەدەر. عەبدالله کوڕی سەبا ڕۆشتەدەر و ڕۆشتە کوفە بەلاّم لەوێیش دەریان کرد. دواتر ئاهەنگی میسری کرد و لەوێ ئارامی گرت و دەستی بەنامە نوسین بۆ هاورێکانی خۆی کرد و ئەوانیش نامەیان بۆ نوسی و بەردەوام پەیك و پەیام لەناو ئەواندا هاتوچۆی دەکرد.

حومران کوڕی ئەبان ژنێکی لەرۆژە رێز لێگیراوەکان، دوای جیابونەوە لەمێردەکەی، وەك هاوسەری خۆی دیاری کرد. بەلاّم عوسمان ئەم دوانەی لەیەك دور کردەوە و لەحومرانیدا و بەرەو بەسرە رەوانەی کرد. ئەو پەیوەستی عەبدالله کوڕی عامر بو. رۆژێك ئەم دوانە باسی ڕۆشتن بۆ لای عامر کوڕی عەبدئەلقەیسیان کرد. حومران وتی: ئایا پێش ئێوە نەڕۆم تا ئەوان ئاگادار بکەمەوە؟ ئەو ڕۆشتە لای عامر و بینی قورئان دەخوێنێت. پێی وت: فەرماندار دەیەوێت بێتە لای تۆ. ویستم ئاگادارت بکەمەوە. پیاو دەستی لەقورئان خوێندن هەڵنەگرت و کتێبەکەی نەبەست. حومران لای ئەو هاتەدەر و کاتێك گەشتە بەر دەروازەی کۆشکی فەرمانداری، کوڕی عامری بینی وپێی وت: لای پیاوێکەوە دێم کەمناڵەکانی ئیبراهیم لەخۆی بەگەورەتر نازانێت. کوڕی عامر ڕۆشتە لای و عیمران قورئانەکەی بەست و دەستیان بەگفتوگۆ کرد. کوڕی عامر پێی وت: ئایا بۆ کۆڕەکانی شەوانەی ئێمە نایێت؟ وتی: سەعد کوڕی ئەبی قورحط حەز بەگەورەیی

دەکات. پرسی: ئایا تۆ بۆ فەرمانداری شوێنێك دەست نیشان نەکەین. وتی: حوصەین کوڕی حوڕ فەرمانداری پەسند دەکات. وتی: ئایا هاوسەرێکت بۆ دیاری نەکەین؟ وتی: رەبیعە کوڕی عەسەل حەز لەژنان دەکات. کوڕی عامر وتی: ئەم پیاوە گومان دەکات تۆ منالەکانی ئیبراهیم لەخۆت بەگەورەتر نازانیت. عامر کوڕی عەبدئەلقەیس قورئانەکەی کردەوە ویەکەم ئایەی بەمشێوەیە خوێند. خواوەند لەپێشی بەخشیوە بەئادەم و نوح و بنەماڵەی ئیبراهیم و بنەماڵەی عیمران بەبەراوەرد لەگەڵ خەڵکانی جیهان (ال عمران/٣/٣٣).

حومران بەزیانی ئەو دەستی بەتۆمەت هەڵبەستن کرد. ئەم حومرانە رۆژگارێکی درێژ تائەو کاتەی خوا ویستی لەبەسرە مایەوە. عوسمان فەرمانی پێدا و لەگەڵ چەند کەسێك گەیشتە مەدینە. خراپەخوازان لەزیانی عامر کوڕی عەبدولقەیس زمانیان کردەوە کەباوەڕی بەژن هێنان نیە، گۆشت ناخوات و ناڕواتە نوێژی هەینی. عوسمان ئەوی بۆ لای معاویە رەوانە کرد، کاتێك ڕۆشتە لای ئەو، لەسەر سفرەکەی ئاوگۆشتی بینی وعەرەب ئاسا دەستی بەخواردن کرد. معاویە زانی درۆیان بۆ ئەو پیاوە داماوە هەڵبەستوە. لەبەر ئەمە هۆکاری دەرکردنەکەی بۆ عوسمان نوسی. عامر کوڕی عەبدولقەیس وتی: بەلام نوێژ هەینی بەم شێوەیە من لەدوای هەمو خەڵکان بۆ نوێژ دەوەستم و پێش هەموویان دەڕۆم. سەبارەت بەژن هێنانیش، پێش هاتن بۆ ئێرە خوازبێینان بۆ من کرد، سەبارەت بەگۆشتیش خۆت بینیت کەخواردم. بەلام من لەگۆشت فرۆشەکان گۆشت ناکڕم چونکە جارێك گۆشت فرۆشێکم بینی مەڕێکی بۆ کوشتارگە دەبرد و کێردی خستە سەر قوڕگی، بەردەوام غورغوری دەوت و سەری بڕی.

معاویە وتی: دەتوانی بۆ شارەکەت بگەڕێیتەوە. عامر وتی: ناڕۆمە شارێك کەخەڵکەکەی بەو شێوەیە ئابروی منیان برد. ئەو لەقەراغ دەریاکان دەگەڕا، معاویە چەندین جار بینی ولێی پرسی: چ نیازێکت هەیە؟ عامر دەیوت، نیازم نیە. کاتێك معاویە پێداگری کرد، عامر وتی: کەمێك لەگەرمای بەسەر بۆ ئێرە بێنە ئەگەری هەیە رۆژو گرتن لەسەر من دژوار بێت چونکە رۆژو گرتن لەسەرزەمینەکەی ئێوە ئاسانە.

## چەند رووداوێکیتر

لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا میقداد کوڕی عەمرۆ ناسراو بەناوی میقداد کوڕی ئەسوەد، هاوڕێی پێغەمبەر(ص) کۆچی دوایی کرد. ئەو وەسیەتی کردبو، زوبەیر نوێژی لەسەر بخوێنێت.

هەروەها لەم ساڵەدا نوفەیل و حوصەین کوڕانی حەرەس کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم کوڕی عەبد مەناف، لەشەڕکەرانی بەدر و ئوحود، مردن. دەستەیەك وتویانە: لەساڵی ٦٥٢/٣١ زایینی یا ساڵی ٦٥٣/٣٢ زایینی کۆچی دواییان کرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی سی و چوارەمی کۆچی

(وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، بەوتەی دەستەیەك، لەم ساڵەدا شەڕی صەورای رویدا. هەروەها لەم ساڵەدا نەیارەکانی عوسمان دەستیان بەنامە نوسین بۆ یەکتر کرد لەشارە جۆراوجۆرەکانەوە تا لەشوێنێك کۆببونەوە و لێکۆڵینەوە لەگەڵ بکەن چونکە بەوتەی زاناکان، لەعوسمان تورە بون.

## ڕێککەوتنی نەیارەکانی عوسمان

پێشتر ئاماژەمان پێدا چەند کەسێك لەخەڵکی کوفە، لەم شارە ڕۆشتنەدەر و لای عەبدولڕەحمان کوڕی خالید نیشتەجێبون. هەروەها لەساڵی یانزەیەمی خەلافەتی عوسمان، سەعید کوڕی عاص وەك میوان ڕۆشتە لای. سەعید یەك ساڵ پێش ڕۆشتن بۆ لای عوسمان ئەوانی لەم شارانە جێگیر کردبو: ئەشعەس کوڕی قەیسی لەئازەربایەجان، سەعید کوڕی قەیسی لەسەرزەمینەکانی ڕەی، نوسەیری عیجلی لەهەمەدان، سایب کوڕی ئەقرەع لەئیسفەهان، مالك کوڕی حەبیبی لەماه، حەکیم کوڕی سەلامی حێزامی لەموسڵ، جەریر کوڕی عەبداللەی لەقرقیسیا، سەلمان کوڕی ڕەبیعەی لەباب، قەعقاع کوڕی عەمرۆی بۆ کاروباری شەڕ و عەتیبە کوڕی نەهاسی لەحیلوان. کوفە بەتەواوەتی لەگەورەکان چۆڵ بو. یەزید کوڕی قەیس بەمەبەستی لەسەر کار لابردنی عوسمان هاتەدەر و ئەو کەسانەی عەبدالله کوڕی سەبا نامەی بۆ ئەوان نوسیبو، هاوڕێیەتیان دەکرد. قەعقاع کوڕی عەمرۆ وتی: یەزید وتی: دەمانەوێت بڕۆین و داوای لەسەر کارلابردنی سەعید بکەین. قەعقاع وتی: ئەگەر بەم شێوەیە، ترسی نیە. ئەوی بەرەڵا کرد. یەزید نامەی بۆ دەرکراوەکان لەشارەکان نوسی تا بڕۆنە لای ئەو. ئەشتەر و ئەو کەسانەی لای عەبدولرەحمان کوڕی خالید بون،بەرەو لای ئەو ڕۆشتن. مالکی ئەشتەر پێش ئەوان کەوت. خەڵك لەرۆژی هەینی هێشتا نەکەوتبونە خۆیان، بینیان مالکی ئەشتەر لەبەر دەرگای مزگەوتە و دەڵێت: من لەلای سەروەری باوەڕدارانەوە هاتومە لای ئێوە. سەعیدم بەجێهێشت کەئاهەنگی ئەوەی بو لەسەر ئەو بنەمایەی کە لەبەخشینەکان بۆ ژنان سەد درەم کەم بکاتەوە و شەڕکەرە بەئەزمونە ڕەنج دیتوەکانی

ئێوە بۆ دوهەزار درەم کەم بکاتەوە. گومان دەکات ئەو سەرزەمینانەی ئێوە بەزۆری شمشێر و بەبەهای خوێنی خۆتان گرتوتانە، باخەکانی قورمیشە. هەستەکانی خەڵك بزوا. فرەزانەکان داوای ئارامیان لەوان دەکرد بەڵام گوێچکەیەك بۆ بیستن دەست نەدەکەوت.

یەزید هاتەدەر و فەرمانی بەجارچیەك دا تا جار بدات: هەرکەس دەیەوێت بۆ گەڕاندنەوەی سەعید پەیوەستی یەزید بێت، با بێت. گەورەکان و فرەزانەکانی شار لەناو مزگەوتدا مانەوە. لەم کاتەدا عەمرۆ کوڕی حورەیس جێگری سەعید بو. ڕۆشتە سەر مێنبەر، سوپاسی خوای کرد، وەسفی کرد و داوای یەکیەتی وفەرمانبەری لێکردن. قەعقاع وتی: ئایا دەتەوێت لافاو بگەڕێنیتەوە؟ ئەگەری نیە! سوێند بەخوا ئاژاوە و وئاژاوەچیەکان تەنیا بەشمشێری مەشرەفی (دروست کراوی شام) دادەمرکێنەوە و ئەمە ئەو شمشێرەیە بەزویی لەکالآن دەردەکێشرێت. ئەوان وەك وشترەکان هاوار و ناڵە دەست پێدەکەن و ئەوەی ئەمرۆ هەیانە، ئارەزوی دەکەن و خوا هەرگیز ئەومیان بۆ ناگەڕێنێتەوە. کەواتەخۆڕاگر بە. وتی: خۆڕاگری دەکەم. بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە. یەزید کوڕی قەیس ڕۆشت و لەجەرعە دابەزی. ئێرە نزیك قادسیە بو. مالکی ئەشتەر هاورێیەتی دەکرد. سەعید کوڕی عاص بەوان گەیشت و پێیان وت: ئێمە نیازمان بەتۆ نیە. سەعید وتی: ئەوندە بەسە بۆ لای سەروەری باوەڕداران کەسێك بنێرن وبۆ لای من کەسێك. ئایا هەزار پیاوی بیرمەند دەڕۆنە لای کەسێك؟ سەعید لای ئەوان گەڕایەوە. ئەوان یەکێك لەکۆیلەکانی ئەویان لەسەر وشترێکی پیر بینی. کۆیلە وتی: شیاو نەبو سەعید بگەڕێتەوە. ئەشتەر ئەوی کوشت. سەعید بەرێکەوت و ڕۆشتە لای عوسمان و لەکاروبارەکان ئاگاداری کردەوە و وتی خەڵك کەسێکیتریان دەوێت وئەبوموسای ئەشعەری پەسەند دەکەن. عوسمان ئەبوموسای ئەشعەری وەك فەرماندار دەست نیشان کرد و بۆی نوسی:

کەسێکم بۆ فەرمانڕەوایی ئێوە هەڵبژارد کەخۆتان داواتان کردبو، سەعیدی لەسەر کار لابرد. سوێند بەخوا ئابروی خۆم بەقەرز دەدەم بەئێوە و خۆڕاگری خۆم بەئێوە دەبەخشم وئێوە بەرنج و هەوڵدان بەرەو رێگای راست دەبەم تا ئەو ئەندازەی هەرچیتان خۆش ویست و هۆکاری نافەرمانی کردنی خوا نەبێت، خوازیاری بن و

هەرچیتان نەویست و هۆکاری گوناح بۆ دەرگای پەروەردگار نەبێت، پشت گوێ بخەن و خوا لەئێوە رازی بێت. لەم کارانە هەر کاتێك بتانەوێت، دیمە لای ئێوە تا ئێوە لای خوا بیانوتان نەبێت. بێ گومان بەهەمان شێوە کەبەمنیان فەرمان داوە، خۆڕاگری دەگەمە پیشە، تا بەوەی دەتانەوێت، بگەن. ئەو فەرماندارانەی نزیك لەکوفە بون، گەڕانەوە، لەوان: عەتەبە کوڕی نەهاس لەحیلوان و جەریر لەقرقیسیا. ئەبوموسای ئەشعەری قسەی بۆ کردن و فەرمانی پێدان هاورێیەتی کۆمەڵی خەڵك بکەن و فەرمانبرداری لەعوسمان بکەن. ئەوان رازی بون و وتیان: پێشنوێژی ئێمە بە و لەگەڵ ئێمە نوێژ بخوێنە. ئەبوموسا وتی: نایەکەم تا ئەو کاتەی بەرفەرمانبردن لەعوسمان رازی نەبن. وتیان: رازین. ئەو پێشنوێژی بۆ ئەوان کرد. فەرماندارانی ژێر دەستی ئەو هاتنە لای و ئەبوموسا ئەوانی لەپێگەکانی خۆیاندا هێشتەوە.,

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری ئاژاوەی جەرعە ئەمە بو کەدەستەیەك لەموسوڵمانان کۆبونەوە و ئاماژەیان بەکارەکانی عوسمان دا ویەکیانگرت. کەسیان بۆ لای عامر کوڕی عەبداللە تەمیمی عەنبەری رەوانە کردکەهەمان عامر کوڕی عەبدقەیسە. ئەویان بۆ لای عوسمان رەوانە کرد. عامر ڕۆشتە لای عوسمان و پێی وت: دەستەیەك لەموسوڵمانان کۆبونەوە و لێکۆڵینەوەیان لەکارەکانی تۆ کردوە و هەستیان بەوە کردوە چەندین کاری نەشیاو و ناپەسەندت ئەنجام داوە. لەخوا بترسە و تۆبە بکە. عوسمان وتی: سەیری ئەم پیاوە بکەن، گومان دەکات خوێنەری قورئانە و ئێستا هاتوە و لەسەر کارە کەم بەهاکان ناسازگاری لەگەڵ من دەکات. سوێند بەخوا دەزانم خوا لەسەر رێگەیە (ئەم گێڕانەوەیە لەموبیدیە: فەجر/٨٩/١٤).

عوسمانی خەڵکانی بەدوای معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و عەبداللە کوڕی سەعید و سەعید کوڕی عاص و عەمرۆ کوڕی عاص و عەبداللە کوڕی عامر رەوانەکرد وئەوانی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد و وتی: هەر پیاوێك وەزیر و چاکەخوازانی هەیە، ئێوە وەزیران و چاکەخوازان و پشتیوانانی منن. خەڵك بەو کارانەوە سەرقاڵن کەدەزانن. داوایان لەمن کردوە فەرماندارەکانی خۆم لەسەر کار لاببەم و لەهەمو کارەکانی خۆم پەشیمان ببمەوە چونکە ئەوان پەسەندی ناکەن و ئەو کارانە ئەنجام بدەم کەئەوان پەسەندی دەکەن. بیربکەنەوە و رێگەچارە بەمن بڵێن. کوڕی عامر وتی:

ئەی سەروەری باوەڕداران بۆچونی من وایە ئەوان بۆ شەڕ و داگیر کردنی وڵاتان بنێرێت تا دەستەمۆ ببن و هەرکەس لەبیری خۆیدا بێت و چارە قونی وشترەکەی و ئەسپێکانی باخەڵی خۆی بکات. سەعید وتی: بەهەنگاوی بەهێز ئەم ئازارە لەخۆت دورکەرەوە و ئەو کەسە یا ئەو شتەی لێی دەترسیت، لەخۆت جیاکەرەوە.، هەر خەڵکێك ڕێبەرانێکیان هەیە کەهەر کات لەناوبچن، ئەو خەڵکە پرژوبلاو دەبنەوە و کارەکان و بارودۆخیان ڕێکناخرێتەوە. عوسمان وتی: بۆچونی راست ئەوەیە تەنیا هەندێ کەم وکورتی هەیە. معاویە وتی: فەرمان بەفەرماندەی سوپاکان بدە تا خەڵکی ناوچەکانی ژێر دەستی خۆیان ناچار بەفەرمانبردن لەتۆ بکەن. من خەڵکانی شام دەکەمە فەرمانبرداری تۆ. عەبدالله کوڕی سەعید وتی: خەڵك لەناخی خۆیاندە تەماحکاران، لەم سامانانە بەوان ببەخشە تا دڵیان بەتۆ خۆش ببێت. عەمرۆ کوڕی عاص هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ بەکسانێك هاوشێوەی ئومەوییەکان سوار ملی خەڵك بویت، تۆ وتوتە و ئەوان وتویانە، تۆ بەلارێدا ڕۆشتویت وئەوان بەلارێدا ڕۆشتون. یادادپەروەری بکەرە پیشە یا واز لەخەلافەت بێنە. بۆچونی بەهێز هەڵبژێرەو و بەچالاکی هەنگاو بەرە پێش. عوسمان وتی: ئاگات لەئەسپێکەی باخەڵی خۆت بێت؟ (یا: ئایا ئەسپێت لەباخەڵی خۆتا نیە؟) ئەم قسەیە بەروی وشیاریەوە دەکەیت؟ عەمرۆ بێدەنگی لێکرد تا بڵاوەیان لێکرد. لەم کاتەدا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەخوا تۆ لای من ڕێزدارتر لەوەیت بەڵام دەمزانی لەپشت دەرگا کەسانێکی لێیە کەوتاری هەر کەسێك بەخەڵکان دەگەیێنن. ویستم قسەکانی من بەخەڵك بگەیێنن تا ببنە پشتیوانی من و زیانی ئەوان لەتۆ دور بکەمەوە. (ئەم قسانەی نە لەروی راستی بەڵکو بەفێڵ و درۆ هێنایە سەرزمان)

عوسمان فەرماندارەکانی خۆی بۆ سەر کارەکانیان گەڕاندەوە و فەرمانی پێدان خەڵکەکەی خۆیان بۆ شەڕ ئامادە بکەن و بۆ وڵاتەکانیان رەوانە بکەن. ئاهەنگی ئەوەی کرد بەخشینە پێویستەکانی ئەوان لەخەڵك بگرێتەوە تا دەستەمۆی ببن. سەعیدی بۆ کوفە گەڕاندەوە کەخەڵك لەجەرعە چاویان پێی کەوت و ئەویان گەڕاندەوە بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا. ئەبو سەوری حەدانی دەڵێت: لەرۆژی جەرەعە لای ئەبومەسعودی ئەنساری و ئەبوحوزەیفە لەمزگەوت دانیشتم. ئەبو مەسعود وتی: گومان

ناکەم ئەم بارودۆخە چاك ببێتەوە مەگەر ئەوەی خوێنی تیا برژێت. حوزیەفە وتی: سوێند بەخوا ئەم کارە چاك دەبێت بێ ئەوەی یەك دڵۆپ خوێنی تیا برژێت. هەمو بارودۆخەکەی ئەمڕۆ، لەسەردەمی پێغەمبەر من دەمزانی. سەعید گەڕایەوە بۆ لای عوسمان و هیچ خوێنێك نەڕژا. ئەبوموسای ئەشعەری بەفەرمانڕەوایەتی گەیشت و عوسمان بەحوزیەفە کوڕی یەمانی فەرمو بۆ شەڕ لەسەرزەمینی باب بەرێکەوێت. حوەزەیفە بەرێکەوت.

## دەسپێکی هەوڵەکان بۆ کوشتنی عوسمان

لەم ساڵەدا کەسانێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر و کەسانیتر نامەیان بۆ یەکتر نوسی و وتیان: بۆ ئێرە وەرن کەشەڕ لەرێگای خواوەند لێرەیە. خەڵك کارەکانی عوسمانیان بەناڕەوا زانی و سەرکۆنەیان کرد و کارەکانی ئەویان بەناپەسەند لەقەڵەمدا. هیچ کام لەهاوەڵانی پێغەمبەر رێگەیان لەخەڵك نەدەگرت و پشتیوانیان لەعوسمان نەدەکرد جگە لەدەستەیەکی کەم و لەوان: زەید کوڕی سابت و ئەبو ئەسیدی ساعدی و کەعب کوڕی مالك و حەسان کوڕی سابت. خەڵك لەماڵی عەلی کوڕی ئەبی تالب کۆبونەوە و سەبارەت بەعوسمان قسەیان لەگەڵ کرد تا رێگە چارەیەك بدۆزێتەوە و گرێیەك لەکارەکانی خەڵك بکاتەوە. عەلی ڕۆشتە لای عوسمان وپێی فەرمو: خەڵك لەپشت سەری منن و سەبارەت بە تۆ قسەیان لەگەڵ کردوم. سوێند بەخوا نازانم چی بەتۆ بڵێم. شتێك ناناسم کەنەیزانی و نازانم بۆ کارێك رێنوێنیت بکەم کەنەیناسیت. تۆ ئەوەی من دەیزانم، دەیزانی. ئێمە پێشتر لەتۆ شتێکمان دەست نەکەوتوە تا تۆی لێ ئاگادار بکەینەوە. هەروەها کارێکی تایبەتمان نەکردوە تۆ تیایدا بەشدار نەبیت. تۆ پێغەمبەرت بینیوە و هاورێیەتی ئەوت کردوە و جیاواز لەمە زاوای ئەویت. قسەکانی ئەوت بیستوە و لەبیرتە. نەکوڕی ئەبوقەحافە لەتۆ شیاوترە تا بەدوای راستی و دروستیدا بڕوات و نەکوڕی خەتاب شیاوتر بۆ ئەنجامدانی چاکیەکان. تۆ لەم دوانە بەپێغەمبەر نزیکتریت و بەهۆی زاوایەتی چەندین شتت پێبڕاوە کەئەوان پێی نەگەیشتن. ئەوان لەهیچ کارێك پێش تۆ نەکەوتن. لەخوا بۆ خۆت بپارێزەوە چونکە نەکوێری تا بینابیت پێببەخشم و نە نەزانیت تا ئاگادارت بکەمەوە. رێگا رون

وئاشکرایە و یاساکانی دین پایەدار. ئەی عوسمان، ئاگادار لەپێشترینی بەندەکانی خوا ڕبێبەرێکی دادەپەروەرە کەرێگەی راستی نیشان بدەن و ئەو بگەڕێتەوە و راستی و دروستی سەقامگیر بکات و کارە نەشیاوەکان پشت گوێ بخات و بمرێنێت. سوێند بەخوا هەموی ئەمانە رون و ئاشکرایە. سونەتەکانی پێغەمبەر زیندوە. خراپترینی بەندەکان لای خوا رێبەرێکی ستەمکارە کاتێك گومڕا دەبێت و گومڕا دەکات و راستی لەناو دەبات و کارە نەشیاو و ناپەسەندەکان زیندو دەکاتەوە. من تۆ لەڕق و تۆتڵەی خوایی ئاگادار دەکەمەوە چونکە ئەشکەنجەکانی ئەو بەئازارە. ئاگادارت دەکەمەوە ئەگەر ئەو رێبەرە بۆ ئەم خەڵکە بیت کەبتکوژن تاڕۆژی هەستانەوە کوشت و کوشتار لەناو ئەواندا دەمێنێتەوە، کارەکان لەوان شاراوە و دەبنە شوێنکەوتویەکی کوێر کەلەترسی زاڵبونی گومڕایی و لاری، نایێنە سەر رێگەی راست و لەتاریکی سەرگەردان بەدەوری خۆیاندا دەسورێنەوە و پەرێشان شەڕی یەکتر دەکەن.

عوسمان وتی: سوێند بەخوا دەزانم خەڵکیش ئەوە دەڵێن کەتۆ دەڵێیت. سوێند بەخوا ئەگەر لەجێگەکەی مندا دەبویت بەتوندی قسەم لەگەڵ تۆ نەدەکرد و ئەمەم نەدەکردە رەخنە لەسەر تۆ و بەبیانویەکی قێزەونم لەقەڵەم نەدەدا کەخزمایەتی بەهێز بکەیت و رێگە لەرەخنە گرتن بگرێت وپێشێڵ کراوێك پەنا بدەیت و کەسانێك وەك ئەو کەسانە بێنیتە سەر کار کەعومەر هێنای. ئەی عەلی سوێندت دەدەم ئایا دەزانی کەموغەیرە کوڕی شەعبە لێرە نیە؟ وتی: بەڵێ. عوسمان وتی: دەزانی کەعومەر ئەوەی وەك فەرماندار دیاری کرد؟ عەلی وتی: بەڵێ. عوسمان وتی: کەواتە بۆ رەخنە لەمن دەگریت کەعەبدالله کوڕی عامرم لەبەر خزمایەتی کردۆتە فەرمانڕەوا؟ عەلی وتی: ئەگەر هەواڵ بەعومەر دەگەیشت کەیەکێك لەفەرمانڕەوکانی بەلارێدا رۆشتوە، بەقاچی خۆی روخساری ئەوی لەخاك دەسو و بەدژوارترین سزا، سزای دەدا. بەلام تۆ ئەم کارە ناکەیت. سستیت کردە پیشە و لەبەرابەر کەس و خزمەکانی خۆت لاوازی و نەرمیت لەخۆت نیشاندا. عوسمان وتی: ئەوان خزمی تۆیشن. عەلی وتی: بەڵێ، بەلام چاکە لەگەڵك وەرگرتن لەکەسانی دیکەدایە هەرچەندە ئەوان پەیوەندیەکی نزیکتریان لەگەڵ مندا هەبێت. عوسمان وتی: ئایا دەزانیت عومەر معاویەی هێنایە سەرکار؟. منیش هەمان کارم پێ سپارد. عەلی وتی: سوێندت دەدەم ئایا نازانی معاویە زیاتر لە

(یەرفا) ((کۆیلەی عومەر)) لەعومەر دەترسا؟ عوسمان وتی: بەڵێ. عەلی وتی: بەلاّم معاویە بێ پرس کردن بەتۆ کاروبارەکان هەڵدەسورێنێت و دەڵێت ئەمە فەرمانی عوسمانە. تۆیش ئەمە دەزانیت و رەخنەی لێ ناگریت.

دواتر عەلی هاتەدەر و عوسمان بەدوای ئەودا بەرێکەوت و رۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: دوای پاڕانەوە لەخوا و سلاّو ناردن بۆ پێغەمبەر، هەر کارێك زیان و کەم و کوڕیەکی تێدایە. زیان و کەم و کوڕی ئەم خەڵکە و هۆکاری کەمی ئەم بەخشینە، دەستەیەکی رەخنەگر و سەرکۆنەکەرن کەئەوەی پێتان خۆشە نیشانتانی دەدەن و ئەگەری پەسەندی ناکەن، لەئێوەی دەشارنەوە. بەئێوە دەڵێن و درێژ دادڕی دەکەن. هاوشێوەی وشترمرەکانن کەبەدوای یەکەم دەنگ بەرێدەکەون. خۆشەویست ترین لەوەڕگا بۆ ئەوان دورترینیانە. جگە لەو ئاوەی لەقورگ گیر دەکات ناخۆنەوە و تەنیا لای سەرچاوە قوڕاویەکان کۆدەبنەوە. پێشەنگیان نیە و لەکارەکانی خۆیان ناتەوانن. ئێوە بۆ کارێك رەخنەتان لەمن گرت کەبۆ کوڕی خەتاب بەرەواتان زانی. بەلاّم ئەو بەپێی خۆی ئێوەی پێشێڵ کرد و بەدەستی خۆی شەقەزللەی لێدان و بەزمانی خۆی سەرکۆنەی کردن. من نەرمیم بۆ ئێوە نیشاندا وئێوەم لەسەر شانی خۆم بەهێزکرد و دەست و زمانی خۆم لەئازاردانی ئێوە کورت کردەوە و ئێوە بێ شەرمانە هێرش دەکەنە سەرم. سوێند بەخوا، من سوپایەکی بەهێزتر، هاورێیانی نزیکتر و ژمارەیەکی زۆرتر و شیاوترم هەیە. ئەگەر بڵێم ((بدەن!)) بەرەو لای من رادەکەن. بۆ ئێوە هاوتاکانی خۆتانم هەڵبژارد و لەبەخشینەکانی خۆم پێ بەخشین، دیانەکانی خۆم نیشاندان، باشیتان لەمن سڕیەوە کە بەباشی بەکاری نابەم و وتارێکتان لەمن گێڕایەوە کەنەمدەهێنایە سەرزمان. زمانتان لەمن دورخەنەوە و رەخنە لەفەرمانڕەوا و رێبەرەکەتان مەگرن چونکە من زیانی کەسێکم لەئێوە دورخستەوە کەئەگەر لەگەڵ ئێوە قسەی دەکرد بەوتارەکەی من شادمان دەبون. من لەحەقی ئێوەدا چ کەمتەرخەمیەکم کردوە؟ من لەگەشتن بەمەبەستەکانی کەسی پێش خۆم ناتەوان نەبوم بەلاّم ئێوە بەم شێوەیە دەوری ئەوتان نەدەگرت گەمارۆی ئەوتان نەدەدا.

مەروان کوڕی حەکەم هەستا و وتی: ئەگەر بتانەوێت سوێند بەخوا شمشێر لەنێوان ئێوە و خۆمان دەکەینە حەکەم. ئێمە ئەو کەسانەین بەمشێوەیە باسیان کردوین:

فرشنا لكم اعراضنا فنبت بكم معرسكم تبنون فی دمن الثری

یانی: ئێمە ئابڕوی خۆمان بۆ ئێوە بڵاو کردەوە و لەبەر ئەمە ئەو ئاسایشگایانەی لەنێوان قوڕ و لیتاو دروست کرابو، بۆ ئێوە ناسازگار بو.

عوسمان وتی: بێدەنگ بە نەکا بۆ هەمیشە بێدەنگ بیت. من و هاوڕێکانی خۆم بەجێبێڵە.. ئەم چ ئاکارێکە تۆ هەتە! مەگەر پێشتر پێم نەوتیت کلك دەرنەهێنیت؟ مەروان بێدەنگ بو وعوسمان لەسەر تەختی وتاردان هاتەخوار. قسەکەی مەروان لای خەڵك گران و ڕقی ئەوان سەبارەت بەو بەتەواوی زیادی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عوسمان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا کەعب الاحبار کۆچی دوایی کرد. ناوی ئەو کەعب کوڕی ماتع بو. ئەولەرۆژگاری عومەری خەتاب باوەڕی هێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبو عەبەس عەبدولرەحمان کوڕی جەبری ئەنساری لەشەڕکەرانی بەدر و مێستەح کوڕی ئوساسەی موتەلیبی (لەپەنجا و شەش ساڵیدا) کۆچی دواییان کرد. زۆربەی مێژوو نوسان وتویانە مێستەح تا رۆژگاری عەلی زیندو بو و لەگەڵ ئەو بەشداری شەڕی صەفینی کرد. ئەویش لەشەڕکەرانی بەدر بو.

عوبادە کوڕی سامتی ئەنساریش لەم ساڵەدا مرد. ئەو لەئامادەبوانی بەیعەتی عەقەبەسەرپەرەستی خەڵکەکەی خۆی و لەشەڕکەرانی بەدر بو.

عاقل کوڕی بوکەیر کە لەبەدریەکان بو، لەم ساڵەدا ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

## روداوەکانی ساڵی سی و پێنجەمی کۆچی(٦٥٥- ٦٥٦ زایینی)

### بەرێکەوتنی خەڵك بۆ گەمارۆدانی عوسمان

دەڵێن: لەم ساڵەدا کەسانێك لەمیسریەکان بەرەو زی خوشوب وکەسانێك لەعێراقیەکان بەرەو زی ئەلەروە بەرێکەوتن.

داستانەکە بەمشێوەیە عەبدالله کوڕی سەبا جولەکە بو و لەرۆژگاری عوسمان باوەڕی بەئاینی مەسیحی هێنا و دواتر لەحیجاز و بەسرە و شام و کوفە دەستی بەگەڕان کرد تا خەڵك گومڕا بکات بەڵام نەیتوانی. خەڵکانی شام ئەویان دەرکرد و ڕۆشتە میسر و لەوێ مایەوە و بەوانی وت: سەیرە کەهەندێ کەس دەڵێن عیسا بۆ ئەم دنیایە دەگەڕێتەوە بەڵام باوەڕ ناکەن محەممەد دەگەڕێتەوە. ئەوبەم کارە بناغەی (گەڕانەوەی) دانا و خەڵك پێی رازی بون. دواتر بەوانی وت: هەر پێغەمبەرێك جێگرێکی هەیە وعەلی جێگری پێغەمبەرە. کێ ستەمکارترە لەو کەسەی پێشنیارەکانی پێغەمبەر بەکار نەبات و جێگرەکەی لەسەر کار لاببات. عوسمان بەناڕاستی و نادروستی بۆ تە خەلیفە، بۆ پاراستنی ئەم کارە هەستن و فەرمانڕەواکانی خۆتان سەرکۆنە بکەن و خەڵك بۆ ئەنجامدانی کارە چاکەکان بانگێشت بکەن و لەکارە خراپەکان دوریان بخەنەوە تا خەڵکان باوەڕ بەئێوە بێنن.

ئەو بانگەوازەکەی خۆی لەناو خەڵکی شارەکاندا بلاّو کردەوە و لەگەڵ ئەوانەی گومڕای کردبون، دەستی بەنامە نوسین کرد و ئەوانیش نامەیان بۆنوسی. بەنهێنی یەکتریان بۆ کارێك هاندەدا و لەسەر بۆچونەکەی خۆیان پشت ئەستور بون. نامەیان سەبارەت بەخراپەکاری و ستەمکاری فەرمانڕەواکان بۆ شارەکان دەنوسی. خەڵکی هەر شارێك نامەیان بۆ شارەکەی تر دەنوسی ویەکتریان ئاگادار دەکردەوە. ئەوەندە ئەم کارەیان دوبارە کردەوە کەمەدینەیان داپۆشی و سەراسەری زەویان بەناگەوازەکەی خۆیان پڕکرد. خەڵکی هەر شارێك دەیانوت: ئێمە لەوەی ئەوان گرفتارن پێی، بەدورین و ئاسودە ژیان بەسەر دەبەین. ئەوان ڕۆشتنە لای عوسمان و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا لەتۆ ئەو شتانە بەخەڵك دەگات کە بەئێمە دەگات؟ عوسمان وتی: تەنیا

تەندروستی و باشبونەوە بەمن گەیشت، ئێوە شەریکەکانی من و شایەتە باوەڕدارەکانن. بۆچونی راست نیشانی من بدەن تا بزانین دەبێت چ کارێك بکەین. وتیان بۆچونمان وایە خەڵکانێك لەوان کەبەوان دلگەرمی و باوەڕت پێیان هەیە، بۆ شارەکان رەوانە بکەیت تا هەواڵەکانی خۆتیان بۆ بێنیت.

ئەو محەممەد کوڕی موسلیمەی بانگ کرد و رەوانەی کوفەی کرد؟، ئوسامە کوڕی زەیدی بۆ بەسرە، عەمار کوڕی یاسر بۆ میسر و عەبدالله کوڕی عومەری بۆ شام رەوانە کرد. جگە لەوان چەندین کەسیتری بۆ سوچ و قوژبنەکانی دیکە رەوانە کرد. هەمویان پێش عەمار گەڕانەوە و وتیان: ئەی خەڵکینە، ئێمە هیچ زیان و کارێکی ناڕاستمان نەبینی، هەروەها گەورەکانی موسوڵمانان و کۆمەڵانی خەڵك لەکار و شتێك نارازی نین. عەمار ئەوەندە دواکەوت گومانیان کرد کوژراوە بەڵام نامەیەك لەعەبدالله کوڕی ئەبی سەرح گەیشت و دەیوت: دەستەیەك عەماریان کردۆتە شوێنکەوتەی خۆیان و دەستیان لەهەر کارێك بەرداوە ولەدەوری ئەو کۆبونەتەوە ولەناو ئەوان: عەبدالله کوڕی سەبا، خالید کوڕی مولجەم، سودان کوڕی حیمران و کەنانە کوڕی بشر. عوسمان نامەی بۆ خەڵکی شارەکان نوسی: دوای سڵاو، داوا لەفەرمانڕەواکان دەکەم هەر ساڵ لەکاتی ئایینی حەج لەمەککە بێنە لای من. خەڵکانی مەدینە گلەییان هێناوەتە لای من کە لەهەر سوچ و قوژبنێك کەسانێکی زۆر هەن کەبەردەوام لێدان دەخۆن و جوێن دەبیستن. هەرکەس ئەم گلەییەی هەیە لەکاتی حەج کردن بێتە لای من و مافەکەی خۆی هەرچی بێت لەمن یا فەرماندارەکانم بگرێت یا بەخشین بکاتە پیشە چونکە خوا بەخشندەکانی خۆش دەوێت. کاتێك نامەکانی ئەو لەشارەکاندا دەخوێندرایەوە، خەڵك دەستیان بەگریان دەکرد و لەخوا بۆ عوسمان دەپاڕانەوە. ئەو نامەی بۆ فەرمانڕەوایی شارەکان نوسی و ئەوان لەکاتی حەج کردن دەهاتنە لای ئەو: عەبدالله کوڕی عامر، عەبدالله کوڕی سەعد، معاویە کوڕی ئەبی سوفیان، وکەسانیتر. سەعید کوڕی عاص و عەمرۆ کوڕی عاصی لەناو کۆڕەکانی ئەوان جێگە کردەوە. دواتر رویکردە ئەوان و وتی: هاوار لەئێوە، ئەم هەمو هاوار و گلەیی خەڵکان لەچیە؟ سوێندبەخوا دەترسم سەبارەت بەئێوە راستیان وتبێت و دەزانم ئەم بارودۆخە تەنیا بەکرداری سەختگرانەی من ئارام دەبێتەوە. پێیان وت: ئایا نێردراوانت بەرێ نەکرد؟ ئایا لەگەورەکان و کۆمەڵانی خەڵك

هەواڵت بۆ نەهاتەوە؟ مەگەر نێردراواکان نەگەڕانەوە کەس لەوان قسەیەکی ناڕەوا و نەشیاوی نەهێنابویە سەرزمان؟ سوێند بەخوا ئەو کەسانەی ئەم قسانەیان هەڵبەستوە، نە راستیان کردوە ونە چاکەکاریان کردۆتە پیشە و ئێمە گومانمان نیە ئەم کارە هیچ بناغەیەکی هەبێت. ڕەوا نیە ئەم قسانە بەگرنگ بزانیت و لەسەر بنەمای ئەم قسانە لێکۆڵینەوە لەگەڵ کەسێك بکەیت. وتی: کەواتە بڵێن چی بکەم. سەعید وتی: ئەمە خۆی درۆیەکی هەڵبەستراوە و بەنهێنی لەناو خەڵکدا بلاّو دەبێتەوە و ئەوان لەهەموشوێنێك گفتوگۆی لەبارەوە دەکەن. چارەکەی ئەوەیە بانگیان بکەیت و ئەو کەسانەی سەرچاوەی ئەم درۆیانەن، کوشتار بکەیت. عەبدالله  کوڕی سەعد وتی: کاتێك ئەوەی تایبەتە بەخەڵك پێیان دەدەیت، ئەوەی لەسەر ئەوانە لێیان وەربگرە چونکە ئەم کارە باشترە لەوەی ئەوان بۆ سەرقاڵ بون بەکاروبارەی خۆیان ئازاد بکەیت. منت بۆ ئەم کارە دیاری کرد و بومە فەرمانڕوای خەڵکێك جگە لەچاکەی ئەوان بەتۆ ناگات. ئەم دوپیاوە باشتر دەزانن لەپانتایی کارەکانیان چی دەگوزەرێت، بۆچونی راست چاکەکاری لەبیرمەندی و بەرێوەبردنی خەڵکانە. عەمرۆ وتی: تۆ لەبەرابەر ئەوان نەرمی و لاوازیت نیشاندا و بەخشینەکانت لەوەی عومەری خەتاب دەیدا، زیاتر کرد. بۆچونم وایە بەرێگەی دوجێگرەکەی پێغەمبەردا بڕۆیت بەمشێوەیە کەهەر کاتێك پێویست بێت سەختگیری و هەر کاتێك پێویست بێت، نەرمی لەخۆت نیشان بدەیت.

عوسمان وتی: ئەوەی باستان کرد، بیستم و بینیم. هەر کارێك دەروازەیەکی هەیە دەبێت لێی بڕۆنە ژوور. ئەم کارە مەترسی بۆ سەر ئەم ئۆمەتە هەیە دەبێت چارەسەر بکرێت و ئەو دەرگایەی بەرویدا دەبەسترێت خوازراو و نەخوازراو دەکرێتەوە. دەبێت بەنەرمی و ئارامی چارەی بکەین مەگەر تەنیا لەئایینە پێویستەکانی خوایی((سزای تاوان و کارە ناڕەواکان کە لەئایینی ئیسلام بێ چەند و چون دەبێت ئەنجام بدرێت). ئەگەر ئەو دەرگایە بکرێتەوە نابێت کەس قسەی لەسەر قسەی من و دەستی بەرزتر لەدەستی من بێت. خوا دەزانێ تەنیا چاکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا کردوە وتەنیا چاکەی ئەوانم داوا کردوە. ئاشی ئاژاوە ئامادەیە، خۆزگە بەرۆژگاری عوسمان ئەگەر بمرێت و ئەم ئاشە نەجوڵێنێت. خەڵك ئارام بکەنەوە و مافەکانیان بدەن. کاتێك دەست درێژیان کردە سەر مافەکانی خواوەند، نەرمی لەخۆتان نیشان مەدەن. کاتێك عوسمان هەستا و

ڕۆشتەدەر و فەرمانداران هاورێ لەگەڵ معاویە بەرێکەوتن، معاویە روی کردە ڕێگا، وشتروانەکەی کەبەردەوام ئاوازی بۆ وشترەکەی دەخوێند، وتی:

قد علكت ضوامر المطى            و ضمرات عوج القسى

ان الامير بعده على            و فى الزبيرخلفه رضى

(و طلحة الحامى لها ولى)

یانی: وشترە لاغرە ناوقەد باریکەکان وکەمانە چەماوە تیرهاوێژەکان، بێ گومان دەزانن عەلی دوای ئەو فەرمانڕەوا و زوبەیر جێگرێکی پەسەندە و تەڵحە بۆ ئەوان پشتیوان.

کەعب وتی: درۆت کرد بەڵکو خواوەندی ئەو وشترە خۆڵەمێشیە کاروبارەکان دەگرێتەدەست. لەهەمان ساتەوە بو معاویە چاوی تەماحی بڕیە خەلافەت.

کاتێك عوسمان هاتە مەدینە، عەلی و زوبەیر و تەڵحەی بانگ کرد و معاویە لای بو. معاویە دەستی بەقسە کرد، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: ئێوە هاوەڵانی پێغەمبەر و هەڵبژێردراوەکانی ئەو و فەرمانڕەواکانی ئەم ئۆمەتەن. جگە لەئێوە کەس چاوی تەماح یا هیوایی بەخەلافەت نیە. ئەم هاورێی خۆتان بێ چاوەڕوانی و دەسەڵات خوازی بۆ ئەم کارە راسپارد. تەمەنی ئەو درێژ بۆتەوە و رۆژگاری خەلافەتی فراوان. ئەگەر خۆڕاگری بکەن تا کاری ئەو کۆتایی پێبێت، زۆر ناخایەنێت هەرچەندە هیوادارم لای خوا بەرێزترلەوە بێت بەو ئەنجامە خراپە بگات. وتارێك بڵاو بۆتەوە کەلەوە دەترسم. هەر شتێك بەبڕوای ئێوە بۆتەهۆی سەرکۆنە کردنی ئەو، دەستی من لەناو دەستی ئێوەدا و بەڵێنتان پێ دەدەم. ڕێگە مەدەن چاوی تەماحکاری خەڵك بۆ ئەم کارە بجوڵێت چونکە سوێند بەخوا ئەگەر چاوی تەماحی تێببڕن، هیچ کات جگە لەپاشەکشێ کردن لێی بەهرەیەك نابەن.

عەلی وتی: ئەی بێ دایك، تۆ چ کارێکت بەم کارە هەیە؟ معاویە وتی: واز لەدایکی من بێنە چونکە خراپترین دایکەکان خراپتر لەدایکی ئێوە نیە. ئەو باوەڕی هێنا وبەیعەتی لەگەڵ پێغەمبەر کرد. ئەوەی بەتۆی دەڵێم، وەڵامی بدەرەوە. عوسمان وتی: کوڕی براکەم راست دەکات. من سەبارەت بەخۆم و ئەو کارەی لەدەستی مندایە، هەواڵ دەدەم. دو هاورێکەی من کەپێش من هاتنە سەر کار، بۆ رەزامەندی خوا لەخۆیان و هەر

کەسێك پێویستی کرد، ستەمیان کرد. پێغەمبەر بەخشینەکانی بەنزیکەکانی خۆی دەبەخشی. من لەناو بنەماڵەیەکی گەورەم کەنانخۆریان زۆر هەیە و هۆکارێکن بۆ داهاتی کەم. لەو کارەی سەرپەرەستیم لەدەستدایە، دەستم بۆ شتێکی بچوك لەو درێژ کرد. ئەگەر ئەمە بەهەڵە دەزانن، وەریبگرنە چونکە کارەکەی من پەیوەستە بەکاری ئێوە. وتیان: راستت کرد. تۆبەعەبداللە کوڕی خالید پەنجا هەزار درەمت بەخشی وبەمەروان کوڕی حەکەم پانزە هەزار. عوسمان ئەم درەمانەی لەوان وەرگرتەوە وئەوان شادمان بون و بەرەزامەندی ڕۆشتنەدەر.

معاویە بەعوسمانی وت: لەگەڵ من وەرە بۆ شام چونکە خەڵکەکەی فەرمانبردارن پێش ئەوەی هێرش بکەنە سەر تۆ و نەتوانی لەبەرابەریان خۆڕاگری بکەیت. عوسمان وتی: دراوسێیەتی پێغەمبەر بەهیچ شتێك نافرۆشم ئەگەر شادەمارەکەم لەسەر ئەم کارە ببڕن. معاویە وتی: چی دەبێت ئەگەر سوپایەك بۆ لای تۆ رەوانە بکەم تا لەرۆژی تەنگانە هاوکاریت بکەن؟ عوسمان وتی: ناخوازم کار لەسەر دراوسێکانی پێغەمبەر دژوار بکەم. معاویە وتی: سوێند بەخوا لەناکاو هێرش دەکەنە سەرت ودەتکوژن. عوسمان وتی: خوا بۆ من بەسە کەباشترین فەرمانڕەوایە.

دواتر معاویە هاتەدەر و لای چەند کەسێك لەموهاجیرەکان تێپەڕی کەعەلی و زوبەیر و تەڵحە لەناویاندا بون. جل وبەرگی سەفەری لەبەردابو. لای ئەوان وەستا و وتی: ئێوە دەزانن زۆربەی خەڵکان لەسەر فەرمانڕەوایی شەڕی یەکتریان دەکرد تا خواوەند پێغەمبەرەکەی خۆی نارد و خەڵك لەسەر بنەمای پێشینەی باشتر وهەوڵ و تێکۆشان لەرێگەی خوا شانازیان بەسەر یەکەوە دەکرد. ئەگەر ئەمە بکەنە بناغەی کاروباری خۆیان، جڵەوی کاروبارەکان لەدەستی ئەواندایە و خەڵك شوێنکەوتەی ئەوانن. ئەگەر خوازیاری ئەم دنیایە بن و بۆ زاڵبون بەسەر ئەم دنیایە شەڕی یەکتر بکەن خوا جڵەوی کاروبارەکان بەکەسێکتر دەسپێرێت چونکە خوا بۆ ناردنی جێگرەوە بەتوانایە. عوسمان کەپیرەپیاوێکی بەتەمەنە، بەئێوە دەسپێرم. پێشنیاری چاکەی بۆ بکەن و پشتیوانی بن تا لەم کارەدا لەو بەختەوەرتربن. دواتر ماڵئاوایی لێکردن و ڕۆشت. عەلی وتی: چاوەڕوانی ئەم باشیەم لەم پیاوە نەدەکرد. زوبەیر وتی: سوێند بەخوا هیچ کات بەئەندازەی ئەمڕۆ لەدڵی تۆ و لەدڵی ئێمەدا گەورە نەبوە.

نەیارانی عوسمان رۆژێکیان دیاری کرد کاتێك فەرمانڕەواکان لەشارەکان بگەڕێنەوە، هەمویان بڕۆنە لای عوسمانیەکان، بەڵام ئەم کارەیان بۆ دەستەبەر نەبو. کاتێك فەرماندارەکان بۆ شارەکان گەڕانەوە و ئەوان نەیانتوانی ئەو بزوتنەوە گشتیە رێکبخەن، نامەیان بۆ یەکتر نوسی تا بڕۆنە مەدینە ولێکۆڵینەوە لەخواستەکانی خۆیان بکەن و داوای ئەو شتانە لەعوسمان بکەن کەهەواڵەکانی بەناو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە. لەمیسر محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە بون کەخەڵکیان دژی عوسمان هاندەدا.

کاتێك میسریەکان هاتنەدەر، عەبدولرەحمان کوڕی عودەیسی بەلەوی لەگەڵ پێنسەد یا هەزار پیاوی شەڕکەر لەگەڵیان بەرێکەوت و ئەم کەسانە لەناویاندابون: کەنانە کوڕی بێشری لەیسی، سودان کوڕی حیمرانی سەکونی و قوتەیرە کوڕی فلانی سەکونی و هەمویان لەژێر فەرماندەیی غافعی کوڕی حەربی عەکی. کوفیان هاتنەدەر و ئەم کەسانە لەناویاندا بون: زەید کوڕی صوحانی عەبدی، مالکی ئەشتەری نەخەعی، زیاد کوڕی نەزری حارسی وعەبدالله کوڕی ئەصەمی عامری. ئەوان لەگەڵ میسریەکان هەژمار دەکران. خەڵکانی بەسرە هاتنەدەر و ئەم کەسانەیان لەگەڵدا بو: حەکیم کوڕی جەبەلەی عەبدی، زورەیح کوڕی عباد، بێشر کوڕی شورەیحی قەیسی و کوڕی موحتەرەش. ئەوان لەژمارەدا لەگەڵ میسریەکان بەرابەر بون و فەرماندەیی ئەوان لەدەستی حورقوص کوڕی زوهەیری سەعدیدابو.

هەمویان لەشەوال/ئاوریلی٦٥٦ زایینی هاتنەدەر و وایان نیشاندا مەبەستیان حەج کردنە. کاتێك گەیشتنە دوری سێ شەو و رۆژ لەمەدینە، کەسانێك لەخەڵکانی بەسرە پێشکەوتن و لەزی خوشوب دابەزین. ئەوان خوازیاری تەڵحە کوڕی عوبەیدالله بون. کەسانێك لەخەڵکانی کوفە هەنگاویان بردە پێش کەپشتیوانی زوبەیر کوڕی عەوام بون و خەڵکانی میرس هاتنە پێش و داوای عەلی کوڕی ئەبی تالبیان دەکرد. هەمویان لەزی ئەلمەروە دابەزین. زیاد کوڕی نەزر و عەبدالله کوڕی ئەصەم لەناو میسریەکان و بەصرەییەکان دەستیان بەهاتوچۆ کرد و پێیان وتن: پەلە مەکەن تا بڕۆینە مەدینە و بارودۆخ بۆ ئێوە سازگار بکەین چونکە بیستومانە ئەوان بۆ شەڕ دژی ئێمە سوپایەکیان ئامادە کردوە. سوێند بەخوا ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێت و ئەوان دوای زانینی

بارودۆخی ئێمە شەڕ کردن لەگەڵ ئێمە بەرەوا بزانن، بۆ ێمە زۆر خراپ دەبێت. ئەگەر ئەوەی بەئێمە گەیشتوە، ناڕاست بێت، ئاگادارتان دەکەینەوە. بەو دوانەیان وت: بڕۆن. ئەو دوانە ڕۆشتنە مەدینە و لەگەڵ هاوسەرانی پێغەمبەر و لەگەڵ عەلی و زوبەیر و تەڵحە چاوپێکەوتنیان کرد و وتیان: ئاهەنگی مەدینەمان هەیە و خوازیاری لەسەر کار لابردنی فەرمانڕەواکانی خۆمانین. داوای فەرمانیان کرد تا بڕۆنە ناو. کوڕی کەعب لەگەڵ ئەوان قسەی کرد و ئەو دوانەی لەم کارە دور خستەوە. ئەو دوانە بۆ لای هاوەڵانی خۆیان گەڕانەوە. کەسانێك لەخەڵکانی میسر کۆبونەوە تا چاویان بەعەلی بکەوێت و کەسانێك لەخەڵکانی بەسرە تا بڕۆنە لای تەڵحە و کەسانێك لەکوفە تا بڕۆنە لای زوبەیر. هەردەستەیەك وتیان: ئەگەر سەروەرەکەمان بەیعەتمان لەگەڵدا بکات چ باشتر وگەرنە ئەوان بەدرۆزن دەزانین و بلاّوەیان پێدەکەین و دواتر دەگەڕێینەوە و لەناکاو هێرشیان دەکەینەسەر. میسریەکان ڕۆشتنە لای عەلی و ئەولە ئوردوێك لەنزیك بەردەکانی رۆن (احجار الزیت) بو. سلاّویان لێکرد و پێشنیاری بەیعەتیان پێکرد. عەلی بەسەر ئەواندا هاواری کرد و ئەوانی لەخۆی دورخستەوە و وتی: چاکەکان دەزانن کەسوپاکەی زی ئەلمەروە و سوپاکەی زی خوشوب لەزمانی محەممەدەوە نفرین کراون. بەسریەکان ڕۆشتنە لای تەڵحە و هەمان وەلاّمیان بیست چونکە ئەویش کوڕەکەی بۆ هاوکاری کردنی عوسمان ناردبو. کوفیەکانیش لای زوبەیر هەمان وەلاّمیان دەست کەوت چونکە ئەویش کوڕەکەی عەبداللەی بۆ لای عوسمان رەوانە کردبو.

ئەوان گەڕانەوە و لەشوێنەکانی خۆی لەئەعوەص و زی خوشوب و زی ئەلمەروە بلاّومیان لێکرد تا خەڵکانی مەدینە بلاّوەی لێکبەن و دواتر هێرش بکەنە سەریان. کاتێك گەشتنە شوێنەکانی خۆیان، خەڵکانی مەدینە بلاّومیان لێکرد و ئەوان گەڕانەوە. خەڵکانی مەدینە نەکەوتبونە خۆیان لەناکاو دەنگی تەکبیر لەهەر لایەکەوە بەرز بویەوە. ئەوان لەشاردا دابەزین و گەمارۆی عوسمانیان دا و وتیان: هەر کەس شەڕ نەکات پارێزراوە. عوسمان چەند رۆژ لەگەڵ خەڵکدا نوێژی خوێند. خەڵك بۆماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە و شۆڕشگێران خەڵکیان لەگفتوگۆ کردن لەگەڵ عوسمان دورخستەوە. خەڵکانی مەدینە هاورێ لەگەڵ عەلی ڕۆشتنە لای شۆڕشگێران و وتیان: چی بو دوای ڕۆشتن گەڕانەوە؟ وتیان: بەهۆی کەسێك کە لەمەدینە هاتەدەر، نامەیەکی عوسمانمان

پێگەیشت کەفەرمانیدا بو ئێمە کوشتار بکەن. تەڵحە ڕۆشتە لای خەڵکانی کوفە ولەهۆکاری گەڕانەوەی ئەوان پرسیاری کرد و هەمان وەڵامی بیست. زوبەیریش ڕۆشتە لای خەڵکانی بەسرە و هەمان وەڵامی بیست. هەموویان دەیانوت: ئێمە پارێزگاری لەبراکانمان دەکەین و هاوکاریان دەکەین. عەلی پێی وتن: ئەی خەڵکانی بەسرە و کوفە ئێوە کە دور کەوتبونەوە چۆن ئاگادار بونەوە خەڵکانی میسر چیان بەسەر هاتوە؟ بۆچی گەڕانەوە؟ سوێند بەخوا ئەمە کارێکە بەرنامەی بۆ دارێژراوە! وتیان: چۆن پێتان خۆشە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن. ئێمە نیازمان بەم پیاوە نیە دەبێت دەست لەکار بکێشێتەوە. عوسمان لەگەڵ ئەوان نوێژی دەخوێند و خەڵك لەپشت سەری ئەو نوێژی دەخوێند و ئەوان لەچاوی ئەو لەخۆڵ نەرمتر بون. ڕێگریان لەکۆبونەوەی خەڵك دەگرت لەشوێنێکدا.

عوسمان نامەی بۆ خەڵکی شارەکان نوسی و داوای هاوکاری لێکردن و فەرموی لەهاتن پەلە بکەن تا پارێزگاری لێ بکەن و ئاگاداریان بکاتەوە خەڵك چۆن ژیان بەسەر دەبەن. خەڵکی شارەکان بەهەر چوارپێیەك دەستیان کەوت، بەرەو مەدینە بەرێکەوتن. معاویە حەبیب کوڕی موسلیمی فیهری رەوانە کرد و عەبدالله کوڕی سەعد معاویە کوڕی خودەیج. قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەکوفە هاتەدەر و لەم شارەدا چەندین کەس هەستان و داوای هاوکاری کردنی خەڵکانی مەدینەیان دەکرد. ئەم کەسانە لەناویاندا بون: عوقبە کوڕی عامر و عەبدالله کوڕی ئەبی ئەوفی و حەنزەلەی دەبیر و کەسانیتر لەهاوەڵانی پێغەمبەر. لەشوێنکەوتوان ئەمانە بون: مەسورق و ئەسوەد و شورەیح و عەبدالله کوڕی حەکیم و کەسانیتر. لەبەسرە ئەمانە ڕاپەڕین: عیمران کوڕی حوصەین و ئەنس کوڕی مالك و هشام کوڕی عامر و هاوەڵانی دیکەی پێغەمبەر. لەشوێنکەوتوان: کەعب کوڕی سور و هەرەم کوڕی حەییان و کەسانیتر. لەشامیش دەستەیەك هاوکاری عوسمانیان کرد بەهەمان شێوە کە لەمیسر.

کاتێك هەینی دوای گەیشتنی ئەوان بەمەدینە گەیشت، عوسمان هات و لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند و ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی:

ئەی خەڵکینە، ئەی خوا خوا! سوێند بەخوا خەڵکانی مەدینە دەزانن ئێوە لەسەر زمانی محەممەد نفرین کراون. هەڵەکەی خۆتان بەکاری چاکە ڕاست بکەنەوە و خراپی

بەچاکی بسڕنەوە.. محەممەد کوڕی موسلیمە هەستا و وتی: من بۆ ئەمە شایەتی دەدەم. حەکیم کوڕی جەبەلە ئەوی دانیشاند. زەید کوڕی سابت هەستا و محەممەد کوڕی ئەبی قوتەیرە ئەوی ناچار بەدانیشتن کرد. شۆڕشیەکان سەراسەر هەستانە سەرپێ وبەرادەیەك وردە بەردیان لەخەڵکانی مەدینە گرت کەناچاریان کردن مزگەوت بەجێبێڵن و بەردیان بۆ عوسمان هاویشت کەلەتەختەکە کەوتە خوار و بێهۆش بو. ئەویان بردەوە بۆ ماڵ. کەسانێك لەخەڵکی مەدینە تا سنوری مردن لەگەڵ عوسمان لێدانیان بەرکەوت (یا لای ئەو شەڕیان کرد) لەناو ئەوان: سەعد کوڕی ئەبی وەقاص و حسێن کوڕی عەلی و زەید کوڕی سابت و ئەبو هورەیرە. عوسمان کەسی بۆ لای ئەوان نارد و سوێندیدان بگەڕێنەوە و ئەوان گەڕانەوە. عەلی و زوبەیر و تەڵحە ڕۆشتنە لای عوسمان تا پەرەستاری بکەن و لەو بەڵایانەی بەهۆی شۆڕشیەکانەوە گرفتاری بون، گلەییان دەست پێکرد. چەند کەسێك لەبەنی ئومەییە و لەناو ئەوانیش مەروان کوڕی حەکەم لای عوسمان بون. هەمویان بەعەلیان وت: تۆ ئەم کارەت کرد و ئێمەت بەرەو لەناوچون برد! سوێند بەخوا ئەگەر بەمەبەستەکەی خۆت بگەیت، دنیا دژی تۆ هان دەدەین. عەلی تورە هەستا و ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بون، هەستان و گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان. دوای ئەوەی ئەوان لەمزگەوت رژانە سەر عوسمان، ئەو سی ڕۆژ لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند. دواتر ڕێگەی پێشنوێژیان لێگرت وسەرکردەی ئەوان غافقی دەستی بەپێشنوێژی کردن بۆ خەڵك کرد. خەڵکانی مەدینە لەباخەکانی خۆیان بڵاوەیان لێکرد و بەماڵەکانی خۆیانەوە لکان. هەموان بەردەوام شمشێرەکانیان هەڵدەگرت تا پارێزگاری لەخۆیان بکەن. گەمارۆدانی عوسمان چل ڕۆژی خایاند. هەرکەس ئاهەنگی ئەوانی کرد، بەشمشێر روبەروی بونەوە.

دەڵێن: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە لەمیسر بون و خەڵکیان دژی عوسمان هان دەدا. محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەگەڵ خەڵکانی میسر هاتەدەر و بەرەو لای عوسمان بەرێکەوت. محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە لەمیسر مایەوە و کاتێك عەبدالله کوڕی سەعد ڕۆشتەدەر، دەستی بەسەر ئەو وڵاتەدا گرت. دواتر ئاماژە بەمە دەدەین. میسریەکان بەمەبەستی کوشتنی عوسمان هاتنەدەر بەڵام وایان نیشاندا دەیانەوێت حەجی عەمرە بەجێبێنن. لەمانگی ڕەجەب / ژانویەی ٦٥٦

زایینی هاتن وسەرکردەی ئەوان عەبدولرەحمان کوڕی عودەیس بەلەوی بو. عەبداللە کوڕی سەعد نێردراوێکی بۆ لای عوسمان رەوانە کرد و لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگاداری کردەوە. عوسمان لەناو خەڵك قسەی کرد و لەمەبەستی شۆڕشیەکان ئاگاداری کردنەوە و وتی: ئەوان بەرەو ئاژاوە هەنگاو دەبەنە پێش و ژیانی من بەدرێژتر لەوەی دەبێت، دەزانن. سوێند بەخوا ئەگەر لەوان جیاببمەوە ئارەزو دەکەن خۆزگە هەر یەك رۆژ لەفەرمانڕەوایی من یەك ساڵی دەخایاند چونکە خوێنرشتنی زۆر و رەنجی بێ ژومار و فەرمانی ناسازگار دەبینن.

عەبداللە کوڕی سەعد بەدوای میسرەکان هاتەدەر تا پەیوەستی عوسمان ببێت. ئەم کارە بەفەرمانی عوسمان بو. کاتێك گەیشتە ئەیلە، بیستی کەمیسریەکان عوسمانیان گەمارۆداوە. بیستی کەمحەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە بەسەر میسردا زاڵبوە و خەڵك بەفەرمانڕەوایی ئەو رازی بون. عەبداللە بۆ میسر گەڕایەوە بەڵام رێگەیان پێ نەدا. هاتە فەلەستین و مایەوە تا عوسمانیان کوشت.

خەڵك لە زی خوشوب کۆبونەوە و ئاهەنگی ئەوەیان کرد ئەگەر عوسمان لەوەی پەسەندی ناکەن پەشیمان نەبێتەوە، بیکوژن. کاتێك عوسمان ئەمەی بینی، رۆشتە لای عەلی و پێی وت: ئەی کوڕی مام، خزمایەتی من وتۆ نزیکە و من مافێکم لەئەستۆی تۆداهەیە. ئەوەی دەیبینی، پێشهاتوە و ئەم خەڵکە بەرەبەیان هێرش دەکەنە سەر من. تۆ لای خەڵك رێزداریت وئەوان بەوتارەکانی تۆ رازی دەبن. دەمەوێت بڕۆیتە لای ئەوان و لەمنیان دوربکەیتەوە چونکە هاتنی ئەوان دەبێتە هۆکاری ریسوا بون و زاڵبونی ئەوان بەسەر من! عەلی وتی: لەسەر بنەمای چ پەیمانێك ئەوان لەتۆ دوربکەمەوە؟ عوسمان وتی: لەسەر بنەمای ئەو پەیمانەی وتەکانی تۆ بەکار ببەم و ئەوەی تۆ فەرمانی دەدەیت، ئەنجامی بدەم. عەلی وتی: من چەندین جار قسەم لەگەڵ ئەوان کردوە. هەر جار دەڕۆم و قسە دەکەم ، دواتر تۆ لەوتەکانی خۆت پەشمیان دەبیتەوە. ئەمانە هەموی دواهاتە شومەکانی مەروان و کوڕی عامر و معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و عەبداللە کوڕی سەعدە. تۆ فەرمانت لەوان برد و نافەرمانی منت کرد. عوسمان وتی: ئێستا فەرمانی تۆ بەکار دەبەم و فەرمانی ئەوان دەخەمە ژێر پێ.

عەلی فەرمانی بەخەڵکدا و سیان لەموهاجیرەکان و ئەنسار لەگەڵی سوار بون و ئەم

کەسانەیش لەگەڵیاندا بون: سەعید کوڕی سەعید کوڕی عاص، عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب کوڕی ئەسید (لەئەنسار) ئەبو ئەسیدی ساعدی، ئەبو حومەید، زەید کوڕی سابت، حسان کوڕی سابت، کەعب کوڕی مالك و نیار کوڕی مەکرەز. ئەوان ڕۆشتنە لای میسریەکان و قسەیان لەگەڵ کردن. ئەوەی قسەی دەکرد عەلی بو و محەممەد کوڕی موسلیمە. میسریەکان بەقسەی ئەمانیان کرد وبۆ میسر گەڕانەوە. کوڕی عودەیس بەمحەممەد کوڕی موسلیمەی وت: ئایا پێشنیاری کارێك بەئێمە دەکەیت؟ محەممەد وتی: بەڵێ، لەخوا بترسە و هاورێکانت لەدەوری ڕێبەرەکەیان دوربکەرەوە و لەکارە نەشیاوەکان خۆت بەدور بگرە. کوڕی عودەیس وتی: بەخواستی خوا ئەمکارە دەکەم. عەلی و هاورێکانیان بۆ مەدینە گەڕانەوە. عەلی ڕۆشتە لای عوسمان و ئەوانی لەگەڕانەوەیان ئاگادار کردەوە و ئەوەی لەدڵیدا بو، باسی کرد و دواتر بەجێی هێشت. عوسمان ئەو ڕۆژە چاوەڕوانی کرد. بەیانی مەروان کوڕی حەکەم هاتە لای و وتی: قسە بکە و خەڵك ئاگادار بکەرەوە کەمیسریەکان گەڕانەوە و ئەوەی سەبارەت بەرێبەرەکەیان بەوان گەیشتوە، هەڵیت و پڵیت بوە. ئەم کارە بکە پێش ئەوەی خەڵکی شارەکانی دیکە بێن و بەلایەکت بەسەردابێت کەنەتوانرێت ڕێگری لێ بکرێت. عوسمان ئەو کارەی کرد. کاتێك قسەی بۆخەڵك کرد، عەمرۆ کوڕی عاص وتی: ئەی عوسمان لەخوا بترسە چونکە تۆ ئەو کارانەت کرد کەئێمە تیایدا بەشدار بوین. بگەرێرەوە بۆ ماڵ تا ئێمەیش بگەڕێینەوە. عوسمان بانگی کرد: ئەی کوڕی نابغە! تۆ لێرەیت؟ سوێند بەخوا لەو کاتەوەی تۆم لەسەر کار لابردوە باخەڵت پڕبوە لەئەسپێ. کەسێکیتر لەسوچێکی مزگەوتەکە هاواری کرد: ئەی عوسمان، تۆبە بکە! عوسمان دو دەستی خۆی بەرز کردەوە و وتی: ئەی خوایە یەکەم کەسم بۆ دەرگای تۆ دەگەڕێمەوە.

عەمرۆ کوڕی عاص بەرەو ماڵەکەی لەفەلەستین بەرێکەوت. دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر شوانێکم لەبیاباندا دەدەی، دژی عوسمان هانم دەدا. ڕۆژێك لەماڵەکەی لەفەلەستین بو و دو کوڕەکەی محەممەد و عەبداللە و سەلامە کوڕی روحی جەزامی لەگەڵیدا بون. سوارەیەك لەمەدینەوە لای ئەوان تێپەڕی کرد. عەمرۆ سەبارەت بەعوسمان پرسیاری لێکرد. سوارە وتی: گەمارۆیان داوە. عەمرۆ عاص وتی: هێشتا کەداغ و ئالاّ لەئاگردایە، کەرە کێوی دەگەوزێت. دواتر سوارەیەکی دیکە لای ئەو تێپەڕی

کرد و عەمرۆ پرسیاری کرد و سوارە وتی: عوسمان کوژراوە. عەمرۆ وتی: من باوکی عەبدالله‌م کاتێك برینێك بخورێنم، خوێنی لێ دێنم. سەلامە کوڕی روح پێی وت: ئەی قورەیشیەکان لەنێوان ئێوە و عەرەبەکان دەرگایەك بو شکانتان! عەمرۆ وتی: ئەو کارەمان کرد تا راستی و دروستی لەناو سکی کەم و کوڕی بێنینەدەر تا خەڵك لەناو تەراوزی مافەکان یەکسان و بەرابەربن.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك لەدوای گەڕانەوە میسریەکان لای عوسمان، عەلی لای ئەوان گەڕایەوە،پێی وت: قسەیەك بکە تا خەڵك لەتۆی ببیستن و شایەتی تۆ بن و خوا روناکی بخاتەدڵی تۆ کەخوازیاری گەڕانەوە لەناڕاستی و ئارەزومەندی راستی و دروستیت چونکە هەمو شارەکان دژی تۆ راپەڕیون و من دەترسم دوبارە کاروانێك لەکوفە یا بەسرە بگات و بڵێی: ئەی عەلی، برۆ لای ئەوان. ئەگەر نەیکەم گومان دەکەیت پەیوەندی خزمایەتیم پچڕاندوە و مافەکانی تۆم پێشێل کردوە. عوسمان ڕۆشت و وتاریدا و گەڕانەوەی خۆی لەناڕاستی ئاشکرا کرد و بەڵێنی بەخەڵکدا بۆ ڕێگەی خوا بگەڕێتەوە. وتی: یەکەم کەسم ئامۆژگاری وەرگرت، بۆ ئەوەی ئەنجامەدا، داوای لێخۆشبون لەخوا دەکەم و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە چونکە شیاوە بۆ کەسێکی وەك من لەهەڵەکان بگەڕێتەوە و پەنا بۆ خوا ببات. کاتێك لەوتارەکەم تەواوبوم، دەبێت گەورەکانی ئێوە بێن و چارەنوسی من دیاری بکەن. سوێند بەخوا ئەگەر بەراستی و دروستی من بکەن بەکۆیلە، وەك کۆیلەکان هەڵس و کەوت دەکەم وەك کۆیلەکان سەر لەخاك دەسوم. لەخوا هیچ شوێنی راکردنێك جگە بۆ لای ئەو نیە. بەخوا ئێوە رازی دەکەم و مەروان و کەسەکانی لەخۆم دوردەکەمەوە و خۆم لەئێوە داناشارم. خەڵك دڵیان بۆی سوتا، دەستیان بەگریان کرد بەرادەیەك ریشی هەمویان تەڕ بو. عوسمان دەستی بەگریان کرد.

کاتێك دابەزی، مەروان و سەعید و چەند کەسێك لەئومەوییەکانی لەماڵەکەیدا بینی. ئەوان وتارەکەی عوسمانیان نەبیستبو. کاتێك دانیشت، مەروان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، قسە بکەین یا بێدەنگ بین؟ نایلە کچی فەرافصە هاوسەری عوسمان وتی: ، نا، بێدەنگ بەچونکە سوێند بەخوا خەڵك ئەو بەگوناحکار دەزانن و دەیکوژن. ئەو قسەیەکی کردوە نابێت پەشیمان ببێتەوە. مەروان بەو ژنەی وت: تۆ کارت بەم کارانە چیە! سوێند بەخوا باوکت مرد و هێشتا نەیدەزانی بۆ نوێژ دەستنوێژ

بگرێت. ژن وتی: ئەی مەروان ئارام بە و باسی باوکان مەهێنەرە سەرزمان. باسی باوکی من دەکەیت کەلێرە نیە بەڵام باوکی تۆ ناتوانێت خۆی رابگرێت! سوێند بەخوا ئەگەر مامی عوسمان نەدەبو و سەرکۆنە کردنی خەمباری نەدەکرد، وتەیەکم دەهێنایە سەر زمان کەهیچ درۆیەکی تیا نەبێت. دەڵێت: مەروان پشتی کردە ئەو ژنە و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، قسە بکەم یا بێدەنگ بم؟ عوسمان وتی: قسە بکە. مەروان وتی: دایك و باوکم بەقوربانی تۆبن. حەزم دەکرد ئەم قسانەت کاتێك دەهێنایە سەرزمان کەبەهێز و پارێزراو دەبویت. دواتر من یەکەم کەس دەبوم پێی رازی دەبوم وهاوکاریم دەکردی. بەڵام تۆ کاتێك ئەم قسانەت هێنایە سەرزمان کەئەم پشتێنە گەشتۆتە گۆی مەمك، لافاو لەشمشێری شێرەکان تێپەڕی کردوە، کاتێك پیاوی ریسوا بەرنامەی ریسواکەری خۆی نیشانداوە. سوێند بەخوا پێداگرتن لەسەر هەڵەیەك کەداوای لێخۆشبونی بۆ بکەن، باشترە لەو گەڕانەوەیە بۆ لای خوا کە لەترسا ئەنجام بدرێت. تۆ ئەگەر بتەوێت، دەتوانیت بۆ لای خوا بگەڕێیتەوە و لێ نزیك ببیتەوە بەڵام بەگوناحکاری بێزار نەبیت. لەبەر دەرگای ماڵەکەت دەستەیەك وەك کێو کۆبونەتەوە. عوسمان وتی: خۆت بڕۆ لای ئەوان و قسەیان لەگەڵ بکە چونکە من لەگفتوگۆ لەگەڵ ئەوان شەرم دەکەم. مەروان هات و خەڵك لەبەر زۆری سوار شان و ملی یەك ببون. مەروان وتی: ئێوە چیتان دەوێت وا کۆبونەتەوە دەڵێی دەتانەوێت شوێنێك تالآن بکەن! روتان ڕەش بێت! کێتان دەوێت! ئامادەن پاشایەتی ئێمە لەدەستی ئێمە دەربێنن! لێرە دورکەونەوە. سوێند بەخوا ئەگەر ئاهەنگی ئێمەتان کردوە، ئەو بەڵایەتان بەسەردادێت کەهیچ کات شاد نابن و ئەنجامی کارەکانی خۆتان پەسەند ناکەن. بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان چونکە سوێند بەخوا ناتوانن دەست بەسەر ئەوەی لەدەستی ئێمەدایە، بگرن. خەڵك گەڕانەوە و دەستەیەك ڕۆشتنە لای عەلی و لەوەی رویدابو، ئاگاداریان کردەوە.

عەلی هات و عەبدولرەحمان کوڕی ئەسوەد کوڕی عەبد یەغوسی بینی و وتی: ئایا لەکاتی وتارەکەی عوسمان ئامادە بویت؟ وتی: بەڵێ. پرسی: ئایا بیستت مەروان چی وت؟ وتی: بەڵێ. عەلی هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا، ئەی موسوڵمانان فریام کەون! ئەگەر من لەماڵەکەم دانیشم، دەڵێت: من و خزمایەتی منت پشت گوێ خست. و ئەگەر بڵێم ئەوەی پێویستە دەبێت ئەنجامی بدات، مەروان دێت و گەمەی پێدەکات و عوسمان

دەبێتە ئاژەڵێکی دەستەمۆ بۆ ئەو کە بۆ هەر شوێنێك بیەوێت، دەیبات و ئەمە دوای ژیانێکی دور و درێژ لەگەڵ پێغەمبەرە. عەلی تورە لەشوێنەکەی هەستا و ڕۆشتە لای عوسمان وپێی وت: ئایا دەستت لەمەروان هەڵنەگرت و ئەو دەستی لەتۆ هەڵنەگرت بەشێوەیەك تۆی لەدینەکەت هەلگەڕاندەوە و لەرێگەی راست بۆ لارێی بردی و تۆی کردە وشترێکی باربەر تا بۆ هەر شوێنێك دەیەوێت، بیبات؟ سوێند بەخوا مەروان نەئەندێشەی لەدینەکەی دەکات نە لەخۆی. سوێند بەخوا مەروان بەشێوەیەك دەبینم تۆ دەباتە لەوەرگا و هیچ کات ناتگەڕێنێتەوە! دوای ئەمە ئیتر بۆ لای تۆ ناگەڕێمەوە. شەرەفی خۆت پێشێل کرد و ئەوان بەسەر هەمو ژیانی تۆدا زاڵ دەبن.

کاتێك عەلی ڕۆشتەدەر، هاوسەرەکەی نایلە کچی فەراصفە هات و وتی: من وتارەکەی عەلیم بیست، ئیتر بۆ لای تۆ ناگەڕێتەوە. تۆ بویتە کەرەستەی دەستی مەروان کەبۆ هەر شوێنێك بیەوێت دەتبات. عوسمان وتی: چی بکەم؟ ژن وتی: لەخوا بترسە و رێچکەی دو هاورێکەت (ئەبوبەکر و عومەر) بگرەبەر چونکە ئەگەر ببیتە فەرمانبرداری مەروان، دەتکوژن. مەروان لای خەڵك نەبەهای هەیە نەترس و نە خۆشەویستی. خەڵك لەزیانی ئەو لەدەوری تۆ بلاوەیان لێکردوە. کەس بۆ لای عەلی بنێرە و دڵی بەدەست بێنەرەوە چونکە ئەو لەگەڵ تۆ خزمە و خەڵکان فەرمانەکانی بەکار دەبەن. عوسمان کەسی بۆ لای عەلی نارد بەلاٚم عەلی نەڕۆشت و وتی: پێم وتوە دوبارە ناگەڕێمەوە. قسەکەی نایلە بەگوێی مەروان گەیشت، هات و لەبەرابەر عوسمان دانیشت و وتی: ئەی کچی فەراصفە! عوسمان وتی: بەقسەی رەق ئازاری نەدەیت چونکە روخسارت ڕەش دەکەم. سوێند بەخوا ئەو زیاتر چاکەی منی دەوێت. مەروان بێدەنگ بو.

عوسمان شەو ڕۆشتە مالی عەلی وپێی وت: من لەرێگەی راست ناگەڕێمەوەو بەڵێنەکەی خۆم دەبەمەسەر. عەلی وتی: دوای ئەوەی ڕۆشتیتە سەر تەختی وتاردانی پێغەمبەر و بەڵێنت بەخەڵکدا، ئەوسا ڕۆشتیتە ماڵ و مەروان هاتەدەر و لەبەر دەرگاکەی تۆ خەڵکی جوێن باران کرد وئەوانی رەنجاند. عوسمانە عەلی بەجێهێشت و بەردەوام دەیوت: منت بەتەنیا بەجێهێشت و خەڵکی لەسەر من بوێر کرد. عەلی وتی: سوێند بەخوا لەهەر کەسێك زیاتر پارێزگاریت لێدەکەم بەلاٚم هەر کاتێك

لەبەرژەوەندی تۆ کارێك پەسەند دەکەم، مەروان دێت و شتێك دەڵێت و تۆ وتەکانی ئەو ئەنجام دەدەیت و وتەکانی من دەخەیتە ژێر پێ.

عەلی جارێکیتر هاوکاری عوسمانی نەکرد تا خەڵك ئاویان لەعوسمان گرت. لەم کاتەدا عەلی بەتەڵحەی وت: دەمەوێت ئاو بۆ عوسمان ببەیت. عەلی بەتەواوی توڕە بو و دانەنیشت تا ئاوی فراوانیان بۆ عوسمان برد.

دەڵێت: دەستەیەك وتویانە عەلی لەکاتی گەمارۆ خستنە سەر عوسمان لەخەیبەر بەسەری دەبرد. هاتە مەدینە و بینی خەڵك لەدەوری تەڵحە کۆبونەتەوە. تەڵحە لەو کەسانە بو گوێی لەوتەکانی عەلی دەگرت و بەکاری دەبرد. کاتێك عەلی هات، عوسمان ڕۆشتە لای وپێی وت: دوای سلاو، من مافی ئیسلام، مافی برایەتی و خزمایەتی و زاوایەتی پێغەمبەرم هەیە. ئەگەر هیچ کام لەمانە نەدەبو وئێمە لەرۆژگاری جاهلی ژیانمان بەسەر دەبرد، ئەمە هۆکاری شەرمی بەنی عەبد مەناف بو کەبەنی تیم (بەنی تەمیم) یانی تەڵحە و کەسەکانی ئەم کارە لەدەست ئێمە دەربێنن. عەلی وتی: بەزویی ئاگادارت دەکەنەوە. دواتر هاتەدەر و ئوسامەی بینی. بەرێکەوت و ڕۆشتەماڵی تەڵحە وبینی خەڵك لەگەڵ ئەو کۆبونەتەوە.

پێی وت: ئەی تەڵحە ئەمە چ کارێکە پێوەی سەرقاڵیت؟ تەڵحەی وتی: ئەی باوکی حەسەن، پشتێن لەگۆی مەمك تێپەڕی کرد. عەلی ڕۆشت تا گەشتە گەنجخانە. وتی: بیکەنەوە. گەڕان و کلیلەکانیان نەدۆزیەوە. عەلی گەنجخانەی کردوە و زێر و زیوەکانی لەناو خەڵکدا دابەش کرد. خەڵك لەدەوری تەڵحە بلاوەیان لێکرد وئەو بەتەنیا مایەوە. عوسمان لەم کارە شادمان بو. تەڵحە ڕۆشتە لای عوسمان وپێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ویستم کارێك بکەم تا خوا جیایی بخانە نێوان من و ئەو! عوسمان وتی: سوێند بەخوا نەك بۆ داوای لێخۆشبون بەڵکو وەك کەسێکی تێکشکاو هاتویت. ئەی تەڵحە، خوا لەنێوان من و تۆ داوەر بێت!

## کوژرانی عوسمان

پێشتر ئاماژەمان پێدا خەڵك[1] چۆن ناهەنگی عوسمانیان کرد. ئاماژەمان بەزۆربەی ئەو هۆکارانەدا کەخەڵك کردیان بەڵگە و بیانو و ئەوانی ناچار بەکوشتنی کرد. ئێستا

باسی ئەوە دەکەین چۆن کوژرا و چی پیشهات کە بۆ کوشتنی پێداگریان کرد.

یەکێك لەهۆکارەکان ئەوە بوگایەلێك لەوشترەکانی زەکاتیان بردە لای عوسمان و ئەو هەموویانی بەیەکێك لەپیاوەکانی بەنی حەکەم (بنەماڵەی مەروان) بەخشی. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف ئەمەی بیست و وشترەکانی وەرگرتەوە و لەناو خەڵکدا دابەشی کرد و عوسمان لەماڵەکەی خۆیدا چاودێری دەکرا.

دەستەیەك دەڵێن: یەکەم کەس لەوتار لەگەڵ عوسمان بوێری لەخۆی نیشاندا، جەبەلە کوڕی عەمرۆ ساعدی بو. عوسمان لای ئەو تێپەڕی و جەبەلە لەکۆڕەکەی خۆی دانیشتبو و زنجێرێکی بەدەستەوەبو. عوسمان سلاوی کرد و خەڵك وەلامیان دایەوە. جەبەلە وتی: بۆ سلاو لەپیاوێك دەکەن کەستەم و بێدادی زۆری کردوە؟ دواتر بەعوسمانی وت: سوێند بەخوا بێ گومان ئەم زنجیرە لەملی تۆ توند دەکەم یا ئەوەی ئەم داروودەستە خراپەکارە لەدەوری خۆت دوردەکەیتەوە، مەروان، کوڕی عامر، و کوڕی سەعید. هەندێك لەمان بەرادەیەك پەست و خراپەکارن کەئایەکانی قورئان سەبارەت بەوان دابەزیوە. لەم کاتەدا بو خەڵك ترسیان لەو نەما و سڵیان لێ نەدەکردوە. پێشتر ئاماژەمان پێدا کاتێك عوسمان وتاری دا، عەمرۆ کوڕی عاص چی پێ وت.

ڕۆژێك وتاری بۆ خەڵکدا و داردەستە تایبەتەکەی پێغەمبەری بەدەستەوە بو کەئەبوبەکر و عومەریش لەکاتی وتاردان دەیانگرت بەدەستیانەوە. جەهجەها غەفاری داردەستەکەی لێ سەند و بەئەژنۆی خۆی شکاندی وخستیە ناو خۆڵدانێکەوە.

دەستەیەك دەڵێن: دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە لەهاوەڵانی پێغەمبەر وکەسانیتر کۆبونەوە و لەهەر کەنارێکەوە گەیشتن و کۆبونەوەیەکیان ڕێکخست و نامەیان بۆ هەمو شارەکان نوسی کە: ئەگەر خوازیاری شەڕ لەرێگەی خوادان، وەرن و دەست پێبکەن. لێرەوە بو چەند بەرەکی لەناو خەڵکان دروست بو. پێشتر باسی ئەمەمان کرد. وەك ئاماژەی پێدرا، خەڵکانی میسر هاتنە مەدینە و عەلی کوڕی ئەبی تالب و محەممەد کوڕی موسلیمە ڕۆشتنە لای ئەوان و گەڕانەوە بۆ میسر بەلام دوبارە گەڕانەوە. کاتێك گەڕانەوە، محەممەد کوڕی موسلیمە ڕۆشتە لای ئەوان و پرسیاری هۆکاری گەڕانەوەی ئەوانی کرد. نامەیەکیان لەناو لولەیەکی مسین دەرهێنا و وتیان: کۆیلەی عوسمان مان لەبوەیب سوار لەسەر وشترێك لەوشترە زەکاتیەکان بینی. گرتمان و هەمبانە و توێشودان

و کەل و پەلەکانی ئەو گەڕاین وئەم نامەمان دۆزیەوە. لەم نامەدا فەرمانی داوەکە عەبدولرەحمان کوڕی عودەیس و عەمرۆ کوڕی حەمەق و عوروە کوڕی بیاع قامچی باران بکەن و ریش و سەریان بتاشن و هەندێك لەوان لەسێدارە بدەن. دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی نامەکەی پێوە گیرا، ئەبو ئەعوەری سولەمی بو. کاتێك ئەویان بینی، پرسیاریان لێکرد بۆ کوێ دەڕوات و وتیان ئایا هەڵگری نامەیە یا نا. وتی: نە. پرسیان: بۆ چ کارێك دەڕۆیت؟ دژایەتی لەقسەکانیدا دروست بو و ڕەنگی گۆڕا. ئەمەیان بەهۆکاری نیگەرانی زانی و ئەویان پشکنی ونامەکەیان لێسەند و گەڕانەوە و خەڵکانی بەسرە و کوفەیش گەڕانەوە. کاتێك میسریەکان گەڕانەوە، محەممەد کوڕی موسلیمەیان ئاگادار کردەوە وپێیان وت: ئێمە قسەمان لەگەڵ عەلی کرد وئەو بەڵێنی پێداین قسەی لەگەڵ بکات. لەگەڵ سەعید کوڕی ئەبی وەقاص و سەعید کوڕی زەید قسەمان کرد وئەم دوانە وتیان بەشداری لەم کارەی ئێوەدا ناکەین. بەمحەممەد کوڕی موسلیمەیان وت دوای نیمەڕۆ لەگەڵ عەلی بڕواتە لای عوسمان. عەلی و محەممەد ڕۆشتنە لای عوسمان و سەبارەت بەمیسریەکان داوای فەرمانیان لێکرد و مەروان لای ئەو دانیشتبو. مەروان وتی: رێگە بدە من لەگەڵ ئەوان قسە بکەم. عوسمان وتی: بێدەنگ بە خوا دەمت بشکێنێت! تۆ کارت بەم کارانە چیە؟ لەماڵەکەی من بڕۆرەدەر. مەروان ڕۆشت. عەلی و محەممەد وتەکانی عوسمانیان بەخەڵکی میسر راگەیاند. عوسمان بەخوا سوێندی خوارد کەئەو نامەی نەنوسیوە و ئاگای لەو نامە نیە. محەممەد وتی: راست دەکات، ئەمە کاری مەروانە.

میسریەکان ڕۆشتنە لای عوسمان و بەناوی سەروەری باوەڕداران سڵاویان لێنەکرد. عوسمان زیانی لەروخساری ئەوان خوێندەوە. خەڵك قسەیان دەست پێکرد. عەبدولرەحمان کوڕی عودەیس دەستی بەقسە کردن کرد و باسی عەبداللە کوڕی سەعیدی کرد کە چ بەلایەکی بەسەر موسوڵمانان و ئەمان پێدراوەکاندا هێناوە و چۆن تالانیەکانی تایبەت کردوە بەخۆی. هەرجار داوای لێکۆڵینەوەی لێدەکەن، دەڵێت: ئەوە نامەی سەروەری باوەڕداران. باسی ئەو کارانایان کرد کە لەمەدینە ئەنجامی داوە. پێیان وت: لەمیسرەوە بەمەبەستی کوشتنی تۆ هاتوین بەلام عەلی و محەممەد کوڕی موسلیمە رێگەیان لێگرتین و بەڵێنیاندا تۆ لەهەمو کارە ناڕەواکانی خۆت پاشگەز ببێتەوە. بۆ

شارەکانی خۆمان گەڕاینەوە و کۆیلەکەی تۆمان بەنامەیەکەوە گرت کەمۆری تۆی لەسەر بو و فەرمانت دابو دەست و لوت و گوێچکەی ئێمە ببڕن و بمانخەنە زیندانە دورودرێژدکانی رۆژگار.

عوسمان سوێندی خوارد نامەی نەنوسیوە، فەرمانی وای دەرنەکردوە و ئاگاداری نیە. محەممەد وتی: عوسمان راست دەکات. میسریەکان وتیان: کەواتە کێ ئەو نامەی نوسیوە؟ عوسمان وتی: نازانم. میسریەکان وتیان: بەم شێوە هەڵس وکەوت لەگەڵ تۆ دەکەن و کۆیلەکەی تۆ سوار وشتری گەنجخانە دەکەن و مۆری تۆ لەنامە دەدەن و دەینرێن بۆ فەرمانڕەواکانی تۆ تا کارە ناڕەوا و ناپەسەندەکان ئەنجام بدات و تۆ نازانیت؟ عوسمانی وتی: بەڵێ. میسریەکان وتیان: یا راست دەکەیت یا درۆ. ئەگەر درۆزن بیت شیاوە دەست لەکار بکێشیتەوە چونکە بەناڕاست و ناڕەوا فەرمانی کوشتنی ئێمەت دەرکردوە. ئەگەر راستگۆ بیت، دوبارە شیاوە دەست لەفەرمانڕەوایی هەڵبگریت چونکە تۆ ناتوانیت کاروبارەکان هەڵسورێنیت و جیاواز لەمە پیاوێکی نائاگایت و دەوروبەرەکانت خراپ و ستەمکارن. شیاو نیە بۆ ئێمە ئەم کارە بەدەست کەسێك بسپێرین کەنائاگا و لاوازە و کارەکان بێ فەرمانی ئەو ئەنجام دەدرێن. دەستبەرداری فەرمانڕەوایی بە بەهەمان شێوە کەخوا دەستبەردارت بوە. عوسمان وتی: ئەو کراسەی خوا لەبەری کردوم، دایناکەنم بەلاّم سوێند بەخوا دەگەڕێمەوە و دەست لەخراپەکاری هەڵدەگرم. میسریەکان وتیان: ئەگەر جاری یەکەم بوایە دەگەڕێیتەوە و تۆبەدەکەیت، رازی دەبوین بەلاّم دەبینین پەشیمان دەبیتەوە و بۆ لای خوا دەگەڕێیتەوە ودواتر درێژە بەخراپەکاری و ستەمکاری خۆت دەدەیت. ئێمە ناگەڕێینەوە تا یا تۆ لەسەر کار لادەبەین یا دەتکوژین تا گیانی ئێمە پەیوەستی خوا بێت. ئەگەر هاورێیان و کەسەکانت هاوکاریت بکەن، شەڕیان لەگەڵ دەکەین تا دەستمان بەتۆ بگات. عوسمان وتی: ئەوەی لەجێنشینی خوا بێزاری بکەم، کوژران لای من پەسەندترە، بەلاّم ئەوەی وتتان هەر کەس پارێزگاری لەمن بکات، دەیکوژن من فەرمان بەکەس نادەم بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە بەلاّم هەرکەس بێ فەرمانی من شەڕ لەگەڵ ئێوە بکات، سەربەخۆ ئەم کارەی کردوە. ئەگەر دەمویست شەڕ لەگەڵ ئێوە بکەم نامەم بۆ سوپاکەی خۆم دەنوسی و ئەوان بەخێرایی خۆیان دەگەیاند، هەروەها دەمتوانی پەنا بۆسوچ و قوژبنێك ببەم.

هات و هاوار بەرز بویەوە.

عەلی هەستا و ڕۆشتەدەر و میسریەکانی ناردە دەر و بەرەو ماڵەکەی خۆی بەرێکەوت. میسریەکان گەمارۆیان خستە سەر عوسمان. عوسمان بۆ معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و عەبدالله کوڕی عامر و فەرماندەکانی سوپا نامەی نوسی و داوای هاوکاری لێکردن و فەرمانیدا لەهاتن و ڕەوانە کردنی سوپا پەلە بکەن. معاویە درەنگی کرد.( چونکە دەیویست ئەو پیرە پیاوە لەناو ببەن تا تاجی پاشایەتی بەدەست بێنێت). یەزید کوڕی عەبداللەی قەسری باوەگەڕێی خالید کوڕی عەبداللەی قەسری لەناو خەڵکانی شام هەستا و دەستەیەکی زۆر هاورێیەتیان کرد. ئەوبەرەو مەدینە بەرێکەوت بەلاَم کاتێك گەیشتە وادی ئەلفورع، بیستی کەعوسمان کوژراوە ولەبەر ئەمە گەڕانەوە. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو حەبیب کوڕی موسلیمەی فێهری لەشامەوە بەرێکەوت و موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی لەبەسرە. کاتێك گەشتنە ڕەبزە و پێشەنگەکانیان ـسێرار لەدەوروبەری مەدینە دابەزین، هەواڵی کوژرانی عوسمانیان بیست و گەڕانەوە.

عوسمان لەگەڵ ڕاوێژکارانی خۆی ڕاوێژی کرد و ئەوان دەنگیان بۆ ئەوەدا تا کەسێك بۆ لای عەلی بنێرێت تا شتێك بەوان ببەخشێت و ڕازیان بکات و بگەڕێنەوە تا ئەم کارە ماوەیەکی زیاتر بخایەنێت و هێزە یارمەتیدەرەکان بگەن. عەلی پێی وتن ناتوانرێت درێژە بەم کارە بدرێت وئیتر ناکرێت گەمە بەخەڵك بکرێت. یەکەم جار ئەوەی توانیم، ئەنجامم دا. مەروان وتی: هەرچیان دەوێت، پێیان بدە تا مۆڵەت بەتۆ بدەن و ڕۆژگار درێژ ببێتەوە چونکە ئەم خەڵکە ستەمیان لەتۆکرد و شیاوی پارێزگاری کردن نین. ئەو عەلی بانگ کرد وپێی وت: دەبینی خەڵك مەبەستی چیان کردوە، دەترسم خوێنم برێژن، ئەوان لەمن دوربکەرەوە و هەرچی لەراستی و دروستی لەمن و کەسانیتریان دەوێت، بەوانی دەبەخشم.

عەلی وتی: خەڵك پێش ئەوەی نیازیان بەکوشتنی تۆبێت، پێویستیان بەکرداری دادپەروەرانەی تۆیە، ئەوان تەنیا بەرەزامەندیەکی تەواو ئارام دەبنەوە. من جاری یەکەم پەیمانم بەواندا بەلاَم تۆ بەکارت نەبرد. ئەم جارە فریو لەمن مەکە چونکە دەمەوێت ئەوەی لەئەستۆی مندایە بەجێی بێنم. عوسمان وتی: داوای هەرپەیمانێکیان کرد، بەڵێنیان پێ بدە و منیش بەڵێن دەدەم پەیمانەکان ببەمە سەر. عەلی ڕۆشتە لای

ئەوەیە دەست لەفەرمانڕەوایی هەڵنەگریت بەڵام ئەگەر دەست لەفەرمانڕەوایی هەڵبگریت، لەپێناو پارێزگاری کردن لەتۆ شەڕ ناکەن.

عوسمان بێدەنگ بو و لەماڵەکەی خۆی دانیشت و فەرمانی بەخەڵکانی مەدینەدا بگەڕێنەوە و ئەوانی سوێنددا پارێزگاری لەو نەکەن. هەموان جگە لەم کەسانە گەڕانەوە: حسێن کوڕی عەلی، عەبدالله کوڕی عەباس، محەممەد کوڕی تەڵحە، عەبدالله کوڕی زوبەیر وکەسانیتر. چەندین دەستەی زۆر هاتنە لای ئەو. رۆژگاری گەمارۆدان چل رۆژی خایاند. کاتێك هەژدە رۆژ کۆتایی هات، چەندین کاروان لەشارەکانەوە گەیشتن ووتیان: سوپایەکی گەورە بۆ شەڕی ئەوان ئامادە و بەرێکەوتوە. ئەم کاروانیانە بوێریان بەخەڵك بەخشی. لەم کاتەدا بو رێگەی هاتوچۆ کردنی خەڵکیان بۆ لای عوسمان بەست و نەیانهێشت هیچ شتێك تەنانەت ئاو بەو بگات. عوسمان بەنهێنی کەسی بۆ لای عەلی و تەڵحە و زوبەیر و هاوسەرەکانی پێغەمبەر نارد کەخەڵك رێگە نادەن ئاو بەمن بگات. ئەگەر دەتوانن ئاو بەمن بگەیێنن. ئەوەی پێش هەموان هاوکاری کرد، عەلی کوڕی ئەبی تالب بو. دواتر دایکی حەبیبە هاوسەری پێغەمبەر بۆ هاوکاری کردنی هاتەدەر. عەلی لەقولایی شەو هات و وتی: ئەو کارەی ئێوە دەیکەن، نەلەکاری باوەڕداران دەچێت نەناباوەڕان. خواردن و ئاو لەم پیاوە درێغ مەکەن چونکە ئێرانی ورۆمیەکانیش کاتێك ئەسیر دەگرن، نان و خواردنیان پێ دەدەن. خەڵك وتیان: سوێند بەخوا تەنانەت رێگە نادەین یەك دڵۆپ ئاوی پێ بگات. عەلی دەستارەکەی خۆی فرێدایە ماڵەکەی عوسمان یانی من کارەکەی خۆمم ئەنجامدا و گەڕامەوە. دایکی حەبیبە سوار لەسەر ئێسترێك بەمەشکەیەك ئاو گەیشت کە لەژێر چارشێوەکەی خۆی دایشاردبو. خەڵك سەری ئێسترەکی ئەویان گرت. ژن وتی: ئەمانەتی ئومەوەییەکان لای ئەم پیاوەیە و دەمەوێت بەدوایدا بگەڕێم تا سامانی بێوەژنەکان وهەتیوەکان بەفیرۆ نەچێت. وتیان: درۆ دەکەیت. جڵەوی ئێسترەکەی ئەویان بەشمشێر بڕی. چوارپێکە ڕەمی کرد ئەوەندە نەمابو ژنەکە فرێبداتە خوار. خەڵك ئەویان هەڵگرت و بردیانەوە بۆ ماڵ.

رۆژێك عوسمان لەسەر بانی ماڵەکەی ڕۆشتە لای ئەوان، سڵاوی لێکردن و دواتر وتی: سوێندتان دەدەم ئایا نازانن من چاڵی رومەم بەسامانی خۆم کڕی تا موسوڵمانان ئاوی لێبخۆنەوە و دواتر خۆم وەك یەکێك لەموسوڵمانان کەڵکم لێوەرگرت؟ وتیان: بەڵێ.

وتی: ئەی بۆ ئاو لەمن دریغ دەکەن تا رۆژو بەئاوی دەریا بشکێنم. وتی: سوێندتان دەدەم ئایا نازانن من فلأن زەمینم کری و پەیوەستی مزگەوتم کرد؟ وتیان: بەڵێ. وتی ئایا بیرتانە پێش من رێگری کەسێکیان لەنوێژ خوێندن لەوێ گرتبێت؟ وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا نازانن پێغەمبەر لەوەسفی من ئەمە وئەوەی وت؟ لەناو خەڵك گرژیەك بۆ پارێزگاری کردن لەو دروست بو. دەستەیەك وتیان: دەست لەسەروەری باوەڕداران هەڵگرن. مالکی ئەشتەر هەستا و وتی: دورنیە ئەو بەدرۆ لەزمانی خۆی وپێغەمبەردوە قسە بکات. عایشە ڕۆشتە حەج و ویستی براکەی خۆی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری لەگەڵ خۆی ببات. محەممەد رازی نەبو. عایشە وتی: سوێند بەخوا ئەگەر دەمتوانی کارێك بکەم ئەوانی لێ دور بخەمەوە، درێغم نەدەکرد. حەنزەلەی دەبیر بەمحەممەدی وت: دایکی خوا پەرستەکان داوای هاورێیەتی لەتۆ دەکات و شوێنی ناکەویت و بەدوای گورگەکانی عەرەبدا بەرێدەکەویت کەدەیانەوێت کارێکی ناڕەوا ئەنجام بدەن! ئەگەر چارەنوسی ئەم کارە بەتاقی کردنەوەی هێز بگات، منالەکانی عەبد مەناف بەسەر تۆدا زاڵ دەبن و لەدەستی تۆی دەردێنن. دواتر حەنزەلە روی کردە کوفە و بەردەوام دەیوت:

| | |
|---|---|
| عجبت لما یخوض الناس فیه | یرومون الخلافة ان تزولا |
| ولو زالت لزال الخیر عنهم | و لاقوا بعدها ـلا ذلیلا |
| و کانوا کالیهود و کالنصاری | سواء کلهم ضلوا السبیلا |

یانی: سەرم سوڕماوە لەوەی خەڵکان تیایدا گرفتارن. ئاهەنگی خەلافەتیان هەیە و دەیانەوێت لەناوی ببەن. ئەگەر لەناو بچێت، باشی لای ئەوان کۆچ دەکات و دوای ئەوە گرفتاری ریسوایی و سوکی دەبن. ئەوان لەجولەکە و مەسیحیەکان دەچن، هەمویان وەك یەکن، هەمویان گومڕا بون.

ئەم هەواڵە بەزوبەیر و تەڵحە گەیشت کەعەلی و دایکی حەبیبە چییان بەسەر هاتوە. ئەم دوانە لەماڵەکانی خۆیان مانەوە و عوسمان بەتەنیا مایەوە بەشێوەیەك هەندێ کات بنەماڵەی حەزام لەکاتی ئاناگایی خەڵك ئاویان بۆ دەبرد. عوسمان لەسەر بانەکەوە ڕۆشتە لای ئەوان و عەبدالله کوڕی عەباسی بانگ کرد فەرمانی پێدا لەگەڵ خەڵك حەج بکات. ئەو لەو کەسانە بو لەبەردەم ماڵەکەی عوسمان پارێزگاری لەو

دەكرد. كوڕی عەباس وتی: شەڕ كردن لەگەڵ ئەم ئاژاوەچیانە لەحەج كردن لای من پەسەندترە. عوسمان سوێندیدا و كوڕی عەباس بەڕێكەوت.

عەبدالله كوڕی عەباس كوڕی ئەبی رەبیعە وتی: ڕۆشتمە لای عوسمان وئەو دەستی منی گرت و ناچاری كرد گوێ لەگفتوگۆكانی خەڵك لەدەرەوە بگرێت. بیستم كەدەستەیەك دەڵێن: بۆ مۆڵەتی پێدەدەن، بۆ نایكوژن؟ دەستەیەك وتیان: مۆڵەتی پێبدەن ئەگەری هەیە لەرێگەی ناڕاست بگەڕێتەوە. هەمان كات كە لەوێ وەستابوم، تەڵحە لەوێ تێپەڕی و وتی: كوڕی عودەیس لەكوێیە؟ عەبدولرەحمان كوڕی عودەیس ڕۆشتە لای ئەو و بەگوێی یەكدا چرپاندیان ودواتر گەڕایەوە و بەهاوەڵانی خۆی وت: رێگە مەدەن كەس بڕواتە لای عوسمان یا كەس لای ئەو بێتەدەر. عوسمان وتی: ئەمە كارێك بو تەڵحە كردی. خوایە دادی من لەتەڵحە وەربگرە چونكە ئەوئەمانەی كۆكردەوە و دژی من هانیدان. هیوادارم دەستی لەمن كورت ببێتەوە و لەسەر ئەم كارە خوێنی برژێت. ویستم بێمەدەر بەڵام خەڵكان رێگەیان لێگرتم. محەممەد كوڕی ئەبی بەكر فەرمانی بەوان دا ورێگەیان بۆ من كردەوە. دەڵێن: زوبەیر پێش كوژرانی عوسمان لەمەدینە ڕۆشتەدەر. دەستەیەك دەڵێن: لەمەدینە بو.

كاتێك میسریەكان زانیان حەج كەران ئاهەنگی ئەوانیان هەیە و دەیانەوێت هاوكاری عوسمان پەیوەستی حەجەكەی خۆیان بكەن و هەروەها بینیان سوپای شارەكان لەئومەوییەكان بۆ هاوكاری كردنی عوسمان بەرێكەوتون، وتیان: ئێمە لەو كارەی گرفتارین پێی، تەنیا بەكوشتنی ئەم پیاوە رزگارمان دەبێت تا خەڵك بەكوشتنەكەیەوە سەرقاڵ بن و دەست لەئێمە هەڵبگرن. ئاهەنگی دەرگای ماڵەكەیان كرد بەڵام حەسەن و عەبدالله كوڕی زوبەیر و محەممەد كوڕی تەڵحە و مەروان كوڕی حەكەم و سەعید كوڕی عاص و هاورێكانیان لەهاوەڵانی پێغەمبەر، بەچالاكی هەستان وپاشەكشێیان بەخەڵك كرد. عوسمان هاواری لەوان كرد و وتی: بۆ هاوكاری كردنی من هیچ كارێك مەكەن. ئەوان رازی نەبون. عوسمان دەرگاكەی كردەوە تا هاوەڵانی خۆی لەهاوكاری كردن دور بخاتەوە. كاتێك هاتەدەر و خەڵكان ئەویان بینی، میسریەكان پاشەكشێیان كرد وهاوەڵانی بەسەر ئەواندا زاڵبون. عوسمان هاورێكانی خۆی سوێند دا تا بڕۆنە ژوور. ئەوان ڕۆشتنە ژور و عوسمان دەرگای لەسەر میسریەكان داخست. لەم كاتەدا

پیاوێك لەئەسلەم بەناوی نیار كوڕی عەیاز لەهاوەڵانی پێغەمبەر هەستا و بەسەر عوسماندا قیژاندی. لەهەمان كات كەسوێندی دەدان تا دەست لەهاوكاری كردنی ئەو هەڵبگرن، لەناكاو كەسیر كوڕی صەڵت تیرێكی بۆ هاویشت كەنیار دەست بەجێ گیانی سپارد.

لەم كاتەدا بەعوسمانیان وت: بكوژەكەی بەئێمە بسپێرە تا بیكوژین. عوسمان وتی: پیاوێك كەهاوكاری منی كرد و رێگەی نەدا من بكوژن، تەسلیمی ئێوە ناكەم. كاتێك ئەمەیان بینی، هێرشیان كردە سەر دەرگاكە. كەس لەوان رێگری لێ نەكردن. دەرگاكە بەسترابو و خەڵك نەیانتوانی بڕۆنە ژور لەبەر ئەمە دەرگا و هەیوانی سەر دەرگاكەیان سوتاند. خەڵكی ناو ماڵەكە خۆیان ئامادە كرد. عوسمان بۆ نوێژ وەستا بو و سورەی (طه) (سورەی ٢٠) دەخوێند. ئەوەی دەیبیست نەبوە هۆكارێك بۆ ئەوەی دەست لەنوێژ و قورئان خوێندن هەڵگرێت. نە هەڵەی كرد، نەزمانی لاواز بو. بەئارامی كۆتایی بەنوێژەكەی هێنا. كاتێك تەواوبو، دەستی بەخوێندنی قورئان كرد و ئەم ئایەی هێنایە سەر زمان: ئەوانەی خەڵك پێیان وتن كەخەڵكان بۆ شەڕ دژی ئێوە كۆبونەتەوە. لەوان بترسن. بەڵام ئەوان زیاتر باوەڕداربون و بەردەوام دەیانوت: خوا بۆ ئێمە بەسە چونكە باشترین پشتیوانە (ال عمران /٣/١٥٧). بەكەسەكانی ناو ماڵەكەی وت: پێغەمبەر پێشنیارێكی بەمن كردوە و من لەسەر ئەوە خۆڕاگرم. درگای ماڵەكەیان نەسوتاند مەگەر ئەوەی مەبەستی كارێكی گەورەتریان هەبێت. من ئەمە لەسەر هەر پیاوێك ناڕەوا دەكەم كەداوای هاوكاری كردن و شەڕ لە هەر پیاوێك بكات یا شەڕ بكات. بەحەسەنی وت: باوكت زیاد لەرادە بۆ تۆ نیگەرانە، سوێندت دەدەم لێردبرۆیت. ئەوان رۆشتنە پێش.و بۆ پارێزگاری كردن لەوشەڕیان كرد وگوێیان لەوتەكانی ئەو نەگرت. لەم رۆژانەدا مەغیرە كوڕی ئەخنەس كوڕی شەریق بەپەلە لەحەج گەڕایەوە و هاورێ لەگەڵ دەستەیەك بۆ هاوكاری كردنی عوسمان گەیشت كە لەماڵەكەی خۆی زیندانی بو. ئەو سوردی شەڕی خوێند و دەیوت:

قد علمت ذات القرون المیل      و الحلی و الانامل الطفول

لتصدقن بیعتی خلیلی      بصارم ذی رونق مصقول

لا استقیل اذ اقلت قیلی

یانی: ئەوانەی قژیان درێژ و بریقەدار و پەنجەی باریك و نەرمیان هەیە بەباشی دەزانن بەیعەت وپەیمانەکەی من لەگەڵ هاورێکەم دەبێتە راستی و من بەشمشێرێکی ئاودراو و درەخشان پارێزگاری لێدەکەم وهەرگیز لەوتارەکەی خۆم پاشگەز نابمەوە.

حەسەن کوڕی عەلی وتی:

لا دینهم دینی و لا انا منهم          حتی اصیر الی طمار شمام

یانی: نەدینی ئێوە دینی منە و نەمن لەوانم. تا ئەو کاتەی لەسەرەو خواری زەوی بەخاك دەسپێردرێم.

محەممەد کوڕی تەڵحە هاتەدەر و وتی:

انا ابن من حامی علیه باحد          و رد احزابا علی رغم معد

یانی: من کوڕی ئەو کەسەم پارێزگاری لەپێغەمبەر کرد لەشەڕ ئوحود و بەریسوایی مەعدیەکان، سوپا شەڕخوازەکانی پاشەکشێ پێ کرد.

سەعید کوڕی عاص هاتەدەر و وتی:

صبرنا غداة الدار و الموت واقب          باسیا فنا دون ابن اروي نضارب

و کنا غداة الروع فی الدار نصرة          نشافههم بالضرب و الموت نائب

یانی: بەرەبەیانی رۆژی شەڕی نێوخۆیی خۆراگرپمان کرد وئەمە لەکاتێکدا بو لەدەر و دیوارەوە مەرگ دەباری. بەشمشێرەکانی خۆمان پارێزگاریمان لەکوڕی ئەروی کرد و ئاژاوەچیەکانمان لەناو برد. لەبەرەبەیانی رۆژی شەڕ لەناوماڵەکەی خۆی هاوکاریمان کرد و لەوانمان دا وبینیمان ئاگری مەرگ خەرمانەکانی ژیان قوت دەدات.

دوایین کەس کەهاتەدەر عەبدالله کوڕی زوبەیر بو. ئەو دوایین ئامۆژگاریەکانی بۆ پارێزگاری کردن لەعوسمان هێنایە سەر زمان. ئەبوهورەیرە هات و بینی خەڵك وەك بەرد لەشوێنەکانی خۆیان وەستاون. وتی: شەڕ کردن لەناوا رۆژێك زۆر باشە! دواتر هاواری کرد: ئەی خەڵکانی من، ئێوە بۆ رزگاری بانگ دەکەم و ئێوە بۆ ئاگر دورم دەکەنەوە (غلفر/٤٠/٤١)

مەروان هاتەدەر و وتی:

قد علمت ذات القرون الميل و الكف و الانامل الطفول

انی اروع اول الرعيل بغارة مثل القطا الشليل

یانی: قژدرێژەکان و بریقدارەکان و دەست و پەنجە باریك و نەرمەکان بەباشی دەزانن من لەپێش پێشەنگەکانەوە شەڕ دەکەم و هاوشێوەی مەلە بەرد خۆرەکان هێرش دەکەمە سەر دوژمنان.

پیاوێك لەبەنی لەیس بەناوی بەیاع هاتەدەر و ئاهەنگی مەروانی کرد. ئەو دوانە لەیەکیان دا. بەیاع گەردنی مەروانی گرت و برینداری کرد و یەکێك لەدەمارەکانی ملی بڕی بەشێوەیەك دوای ئەوە مەروان بە ملی کورت و کوڵ ژیانی بەسەر برد. عوبەید کوڕی روفاعەی زورەقی ئاهەنگی مەروانی کرد تا بیکوژێت. فاتیمە دایکی ئیبراهیم کوڕی عودەی کەشیری بەمەروان و کەسانێتر دابو، هەستا و وتی: ئەگەر دەتەوێت ئەو بکوژیت، ئەو کوژراوە. ئەگەر دەتەوێت جەستەی بشێوێنیت ئەمە کارێکی قێزەونە. ئەو مەروانی بەرەلاَ کرد، ژن مەروانی هەڵگرت وبردیەوە بۆ ماڵ. مناڵەکانی مەروان رێزیان لەم کارە گرت و دواتر کاتێك هاتنەسەر کار، فەرمانڕەواییان بەئیبراهیم بەخشی. ئاهەنگی موغەیرە کوڕی ئەخنەس کوڕی شوردیقیان کرد و ئەویان کوشت. کاتێك بیستی، .خەڵك ناوی ئەو دەبەن، وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦) عەبدولرەحمان کوڕی عودەیس وتی: چیت بەسەر دێت؟ پیاو وتی: شتێکی هاوشێوەی خەوم بینی و لەجارچیەکم بیست کەدەیوت: مژدەی ئاگر بەبکوژەکەی موغەیرە کوڕی ئەخنەس بدە. ئێستا من گرفتاری خوێنی ئەو بوم.

خەڵك لەماڵەکانی دەوروبەر و لەناو ئەوان لەماڵی عەمرۆ کوڕی حوزام، هێرشیان کردە سەر ماڵی عوسمان و ئەوانەی لەبەردەرگا پاسەوانیان دەدا، نەیانزانی. خەڵك بەسەر عوسماندا زاڵبون و بەدوای کەسێکدا دەگەڕان تا خوێنی برێژێت. پیاوێك ئامادە بو، لەناو ماڵەکەی رۆشتە لای وپێی وت دەست لەکار بکێشەردوە تا ئازادت بکەین. عوسمان وتی: هاوار لەتۆ! من بەناڕەوا چ لەرۆژگاری جاهلی و چ لەرۆژگاری ئیسلامی جل وبەرگی هیچ ژنێکم دەرنەهێنا و گۆرانیم نەخوێند و هەڵیت و پلیتم نەوت ولەو کاتەوەی بەیعەتم لەگەڵ پێغەمبەر بەستوە، دەستی راستم نەخستۆتە سەر شەرمی خۆم. ئەو کراسەی خوا کردویەتیە بەرم، دایناێم تا خوا بەختەوەرەکان رێزدار بکات و

بەدبەختەکان رورەش! پیاو هاتەدەر. وتیان: چیت کرد؟ وتی: جگە لەکوشتنی ئەوئێمە لەدەست خەڵك رزگار ناکات و کوشتنی ئەو ڕەوا نیە. پیاوێك لەبەنی لەیسیان ناردە لای. عوسمان پێی وت: تۆ بکوژی من نیت چونکە پێغەمبەر لەبەرژەوەندی تۆ لەخوا پاڕاوەتەوە کەتا فلأن رۆژ زیندو بیت. تۆ گومڕا نەبویت. پیاو هاتەدەر و ئەوانی بەجێهێشت و لەوێ دورکەوتەوە.. پیاوێك لەقوڕەیشیەکان ڕۆشتە لای. عوسمان پێی وت: پێغەمبەر لەفلأن رۆژ لەخوا بۆ تۆ پاڕایەوە. تۆ خوێنی ناڕەوا نارێژیت. ئەو گەڕایەوە و لەهاوەڵانی خۆی جیابویەوە. عەبدالله کوڕی سەلام هات و لەکوشتنی عوسمان رێگری کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، شمشێری خوا لەناو خۆتاندا لەکالأن دەرمەکێشن چونکە سوێند بەخوا ئەگەر لەکالأن دەریبێنن هیچ کات ناچێتەوە ناو کالأن. هاوار لەئێوە! ئەمڕۆ بەقامچی فەرمانڕەوایی ئێوە دەکەن و ئەگەر ئەو بکوژن بەئاسن و شمشێر فەرمانڕەوایەتیتان دەکەن. هاوار لەئێوە! شار لەفریشتەکان پڕبوە، ئەگەر بیکوژن، لەم شارە کۆچ دەکەن. پێیان وت: ئەی پیاوی لەجولەکەبو! تۆ کارت بەم کارانە چیە؟ ئەو گەڕایەوە. دوایین کەس کەڕۆشتە لای و گەڕایەوە، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بو. عوسمان وتی: هاوار لەتۆ، ئایا هیچ ستەمێکم لەتۆ کردوە یا مەبەستەکانی تۆم نەهێناوتەدی؟

محەممەد ریشی گرت و وتی: ئەی پیری کەمتیاری خلەفاو! خوا تۆ ریسوا دەکات! وتی: من خلەفاو نیم بەڵکو سەروەری باوەڕداران، عوسمانم. محەممەد وتی: معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و فلأن و فلأن هیچ کارێکیان بۆ تۆ نەکرد! عوسمان وتی: کوڕی براکەم، ئەگەر باوکت دەبو، بەم ریسواییە ریشی منی نەدەگرت. محەممەد وتی: ئەگەر دەبو و دەیبینی چ ستەمکارییەك دەکەیت، ریشی دەگرتیت. ئەوەی دەمەوێت لەگەڵ تۆی بکەم، لەمە زۆر دژوارترە. عوسمان وتی: لەبەرابەر تۆ پەنا بۆ خوا دەبەم و داوای هاوکاری لەو دەکەم!. محەممەد وازی لێهێنا و هاتەدەر.

دەستەیەك دەڵێن: محەممەد بەزوبینەکەی دەستی لەناوچاوی ئەوی دا. گێڕانەوەی یەکەم راستترە.

دەڵێت: کاتێك محەممەد هاتەدەر و ئەوان دەیانزانی لەبەرابەر عوسمان تێکشکاوە، قوتەیرە و سودان کوڕی حیمران و غافقی تورە بون. غافقی بەکەڕەستەیەکی ئاسنین

لێیدا و بەشەق قورئانەکەی لەدەستی فڕێدا. قورئانەکە سوری خوارد و لەبەردەم عوسمان بەکراوەیی کەوتەخوار و خوێنی عوسمان رژایە سەری. سودان هات تا لێی بدات. ژنەکەی عوسمان هات و خۆی کردە قەڵغانی شمشێرەکە. ئەو پەنجەی ژنەکەی کردە نیشانە و بڕی. ژن هەڵات. ئەو پیاوە سمتی ئەوی گوشی و وتی: قونێکی قەڵەوی هەیە! لەعوسمانی دا و کوشتی.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی عوسمانی کوشت، کەنانە کوڕی بێشری توجەیبی بو. عوسمان ئەوە شەوە لەخەوی خۆیدا پێغەمبەری بینی کەپێی وت: ئەمشەو، نانی ئێوارێ لای ئێمە دەخۆیت. کاتێك کوژرا، دڵۆپێك لەخوێنەکەی رژایە سەربەرگی قورئان لەسەر ئەم ئایە: بەزوویی خوا دادی تۆ لەوان وەردەگرێت (بقرە٢/١٣٧). کۆیلەکانی عوسمان لەگەڵ خەڵك رۆشتنەدەر تا هاوکاری بکەن. عوسمان ئەو دەستە لەکۆیلەکانی ئازاد کرد. کاتێك سودان لێیدا یەکێك لەکۆیلەکان بەشمشێر لەملی سودانی دا و کوشتی. قوتەیرە هێرشی کردە سەر ئەو کۆیلە وکوشتی. ئەوەی لەماڵەکەدا بو تاڵانیان کرد و دواتر رۆشتن و دەرگایان لەسەر ئەو سێ کوژراوە داخست. کاتێك رۆشتنەدەر یەکێك لەکۆیلەکانی عوسمان هێرشی کردە سەر قوتەیرە و کوشتی. دەنگە دەنگ لەخەڵکان بەرز بویەوە و ئەوەی دەستیان کەوت تاڵانیان کرد و زێر و زیوی ژنەکانی عوسمانیان برد. کولسومی تەجیبی شاڵێکی سەرشانی نایلەی هەلگرت و تالآنی کرد. کۆیلەی عوسمان ئەوی گرت و کوشتی. هاواریان کرد: فریایی گەنجینە بکەون و رێگەمەدەن پێش ئێوە دەستی بەسەردا بگرن. پاسەوانانی گەنجینە ئەمەیان بیست و بینیان جگە لەدو گوێنی هیچی لێ نەماوە. لەبەر ئەمە هاواریان کرد: رابکەن چونکە ئەمان شوێن مەبەستەکانی ئەم دونیایە کەوتون! رایان کرد و شۆڕشگێڕەکان هاتن و گەنجینەیان تاڵان کرد. خەڵك بەربونە یەك.

دەڵێن: ئەوان لەکوشتنی پەشیمان بونەوە. بەڵام عەمرۆ کوڕی حەمق، هاتە سەر سینەی عوسمان کەهێشتا نیوە گیان بو، نۆ جار بەشمشێر لێیدا. وتی: سێ جار بۆ رەزامەندی خوا لێمدا. شەش جارەکەیتر بۆ خاڵی کردنەوەی دڵم لەستەمکاری ئەم پیاوە بو. ویستیان سەر لەجەستەی جیا بکەنەوە. ام البنین و نایلە خۆیان فرێدایە سەری و دەستیان بەهاوار کرد و بەشەقەزللە لەخۆیان دەدا. عەبدولرەحمان کوڕی عودەیس

وتی: وازی لێ بێنن. عومەر کوڕی زابی هات و لەقەیەکی لێدا و یەکێك لەپەراسوەکانی شکاند و وتی: باوکمت زیندانی کرد و ئەوەندەت ئەشکەنجە کرد تا لەزینداندا گیانیدا.

گوژرانی ئەو لەرۆژی هەینی هەژدەی زی حەججەی ساڵی سی و پێنجی/ ١٧ ژوئەنی ٦٥٦ زایینی بو. ماوەی خەلافەتەکەی سیانزە سال جگە لەهەشت یا دوانزە ڕۆژ بو. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نیە بەڵکو گوژرانەکەی لەهەژدەی زی حەججەی ساڵی سی و شەش/ ٢٤ سێپتامبەری ٦٥٧ زایینی بو. دەستەیەك دەڵێن: لەرۆژەکانی روناك کردنەوە) رویدا. ئەو لەکاتی گوژران ٨٢ یا ٨٨ یا ٩٠ یا ٧٥ یا ٨٦ ساڵی بو.

## شوێنی بەخاك سپاردنی عوسمان

ئەو کەسەی نوێژی لەسەر خوێند

دەڵێن: جەستەی عوسمان سێ رۆژ لەسەر جێگاکەی بو و کەس بەخاکی نەدەسپارد. دواتر جوبەیر کوڕی موتعیم و حەکیم کوڕی حەزامی قورەشی داوای فەرمانیان لەعەلی کوڕی ئەبی تالب وەرگرت و قسەیان لەگەڵ کرد تا فەرمان بدات و بەخاکی بسپێرن. عەلی ئەو کارەی کرد. کاتێك دوژمنەکانی بیستیان ئەم کارە ئەنجام دەدرێت، بەدەست و دواوێنی پڕ بەرد لەسەر رێگاکەی دانیشتن. چەندین کەس لەبنەماڵەکەی ئەو و کەسانیتر هاتنەدەر کەزوبەیر کوڕی عەوام و حەسەن کوڕی عەلی و ئەبو جوهم و حوزەیفە کوڕی یەمان و مەروان کوڕی حەکەم لەناو ئەواندا بون. ئەوان جەستەی عوسمانیان لەنێوان دو نوێژی شەوان و خەوتنان هێنایەدەر وبەرەو باخێك لەباخەکانی مەدینەیان برد کەپێیان دەوت (ئاورێژگای ئەستێرە) (حش کوکب) لەدەرەوەی بەقیع. جوبەیر کوڕی موتعیم یا حەکیم کوڕی حوزام یا مەروان کوڕی حەکەم نوێژی لەسەر خوێند. چەندین کەس لەئەنسار هاتن تا رێگە نەدەن کەس لەسەر ئەو نوێژ بخوێنێت بەلام لەترسی ئاژاوە ئەوانیان بەجێهێشت. عەلی کەسێکی بۆ لای ئەو کەسانە رەوانە کرد کە لەسەر رێگا دانیشتبون و دەیانویست جەستەی ئەو بەردباران بکەن. بیستی ئەوان مەبەستێکی لەمشێوەیان هەیە و لەبەر ئەمە فەرمانی پێدان دەست لەو جەستە هەڵبگرن. ئەویان لە (حش کوکب) بەخاك سپارد. کاتێك معاویە کوڕی ئەبی سوفیان

هاتەسەر کار، فەرمانی دا و دیواری ئەو باخەیان وێران کرد و ئەو زەمینەیان پەیوەستی گۆڕستانی بەقیع کرد. فەرمانی بەخەڵکدا مردووەکانی ڕۆژگاری خۆیان لەدەوری قەبری عوسمان بەخاك بسپێرن تا ئەو کاتەی گۆڕی عوسمان پەیوەستی گۆڕی موسوڵمانان بو. دەستەیەك دەڵێن: لەشوێنێك دیوار بەدیواری ئاورێژگەی ئەستێرە بەخاك سپێردرا. دەڵێن: ئەم کەسانە لەرێ و رەسمی بەخاك سپاردن ئامادە بون: عەلی، تەڵحە کوڕی عوبەیداللە، زەید کوڕی سابت، کەعب کوڕی مالك وهەمو ئەو هاوەڵانی لەو ڕۆژانەدا پارێزگاریان لێدەکرد. دەڵێن: ئەویان نەشۆرد بەڵکو بەهەمان شێوە بەخاکسیان سپارد.

## نمونەیەك لەکردارەکانی عوسمان

حەسەنی بەصری دەڵێت: ڕۆشتمە مزگەوت و بینیم عوسمان لەسەر عاباکەی خۆی دانیشتوە. لەم کاتەدا دو ئاوکێش هاتنە لای و داوەریان بردە لای ئەو. عوسمان لەنێوان ئەم دوانە داوەری کرد.

شەعبی دەڵێت: پێش ئەوەی عومەر کوڕی خەتاب کۆچی دوایی بکات، قوڕەیشیان لەو بێزار ببون چونکە ئەوانی لەمەدینە جێگر کردبو و ڕێگەی چونە دەردوەی پێ نەدەدان (لەبەر ئەوەی نەکا لەپێگەکانی خۆیان خراپ کەڵك وەربگرن و خەڵك ئازار بدەن). عومەر بەردەوام دەیوت: مەترسیدارترین بابەت کە من بۆ ئەم ئومەتە لێی دەترسم، بلاْو بونەوەیان لەناو شارەکاندایە. ئەگەر یەکێك لەوان بۆ بەشداری کردن لەشەڕێك داوای فەرمانی لێدەکرد، عومەر دەیوت: ئەو ئەندازەی بۆ پێغەمبەری خوا شەڕت کردە بۆ تۆ بەسە و دەتگەیینێتە مەبەستەکەت. باشتر لەشەڕ کردنی ئەمڕۆی تۆ ئەوەیە ئەم جیهانە نەبینی و جیهان تۆ نەبینێت. ئەو لەگەڵ موهاجیرەکانی قوڕەیش بەم شێوەیە هەڵس و کەوتی دەکرد و لەگەڵ خەڵکانی دیکەی مەککە ئەم کارەی ئەنجام نەدەدا. کاتێك عوسمان هاتەسەر کار ڕێگەی بۆ ئەوان کردەوە و قوڕەیشیەکان لەشارەکاندا بلاْو بونەوە و خەڵك دەوریان گرت. ئەوان عوسمانیان زیاتر لەعومەر خۆش دەویست.

دەڵێن: عوسمان لەهەمو ساڵەکانی خەلافەتی خۆی لەگەڵ خەڵك حەجی کرد و ژنانی پێغەمبەری لەگەڵ خۆی دەبرد بەهەمان شێوە کەعومەر ئەو کارەی ئەنجام دەدا.

عوسمان نامەی بۆ فەرمانداڕانی شارەکان نوسی و فەرمانی پێدان لەکاتی حەج کردن بڕۆنە لای و ئەو کەسانەی گلەیی و گازندەیان لەوان هەیە، ئەوانیش بێن تا داوەری لەنێوان ئەواندا بکات. فەرموی: خەڵك بەئەنجامدانی کارە چاکەکان ناچار بکەن و لە کارە خراپەکان دوریان بخەنەوە. وتی: ناتەوان تا ئەو کاتەی ستەملێکراو بێت، من لەگەڵ خۆی و ڕوبەڕوی ستەمکار دەبینێت.

دەڵێن: یەکەم کرداری ناشیرین کە لەمەدینە دەرکەوت، ئەوە بو لەسەراسەری شارەکان فڕینی کۆترەکان (کۆتربازی) و تیرهاویشتن بەقۆچەقانی دەستی پێکرد. عوسمان لەهەشتەمین ساڵی فەرمانڕەوایی خۆی پیاوێکی لەبەنی لەیس بۆ ئەم کارە ڕاسپارد کە باڵی کۆترەکانی بڕی و قۆچەقانیەکانی شکاند.

دەڵێن: پیاوێك لەسەعید کوڕی موسەییب سەبارەت بەمحەممەد کوڕی حوزەیفە پرسیاری کرد کەچ هۆکارێك ئەوی بۆ شۆڕش کردن دژی عوسمان هاندا. وتی: کوڕێکی باوك مردو کە لەداوێنی عوسمان پەروەردە کرا. ئەو سەرپەرەستی منالە باوك مردوەکانی بنەماڵەکەی خۆی خەرجی هەمویان لەئەستۆ گرتبو. داوای لەعوسمان کرد ئەو وەك فەرمانڕوایی شوێنێك دیاری بکات. عوسمان وتی: کوڕی خۆم، ئەگەر بۆ ئەم کارە شیاو بویتایە، تۆم بۆ فەرمانڕەوایی ناوچەیەك ڕادەسپارد. محەممەد وتی: کەواتە فەرمان بەمن بدە تا بەدوای ڕۆژی خۆمدا بڕۆم. عوسمان وتی: بۆ هە شوێنێك دڵت دەیخوازێت، بڕۆ. عوسمان ساز وبەرگ و توێشو و چوارپێ وسەرمایەیی پێدا. کاتێك محەممەد گەیشتە میسر، لەو کەسانە بو خەڵکی دژی عوسمان هان دەدا چونکە فەرمانداری لەو درێغ کردبو. پرسی: عەمار کوڕی یاسر؟ سەعید کوڕی موسەییب لەوڵامدا وتی: لەنێوان ئەو و عەباس کوڕی عەتەبە کوڕی ئەبی لەهەب دەمەقاڵەیەك دروست بو کەعوسمان لەهەر دوکیانی دا و لەبەر ئەمە لەنێوان بنەماڵەی عەباس و عەمار دوژمنایەتی دروست بو چونکە ئەم دوانە تۆمەتی ناڕەوایان بۆ یەك هەڵبەستبو.

دەڵێن: سەبارەت بەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەسالم کوڕی عەبدالله پرسیاریان کرد کە بۆ دژی عوسمان ڕاپەڕی. وتی: توڕەیی و تەماح. لەئایین ئیسلام پێگەیەکی بەرزی هەبو و کەسانێك قسەیان بۆ کرد و فریویان دا و ئەو خۆپەسندی کردەپیشە و تەماحکار بو. ئەو کارێکی لای عوسمان بو و حەقێکی کەوتە ملی عوسمان و عوسمان

ئەو سامانەی لێ سەند. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا یەکیان گرت و محەممەد کەسەرەتا وەسفی عوسمانی دەکرد، دەستی بەسەرکۆنە کردنی کرد.

دەڵێن: پیاوێك عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی ریسوا کرد و عوسمان لەو پیاوەی دا و خەڵك ئەم کارەیان پێخۆش بو. عوسمان وتی: ئایا ڕەوا بو پێغەمبەر ڕێز لەمامی بگرێت و من بەڕەوای بزانم بەشێوەیە ریسوایی بکەن؟ دوژمنی پێغەمبەری خوایە ئەو کەسەی ئەم کارە بکات و بەمە رازی بێت.

دەڵێن: کەعب کوڕی زی ئەلحەبکەی ئەهدی یاری بەنارگیلیەکان دەکرد و هەواڵی ئەم کارە بەعوسمان گەیشت. نامەی بۆ وەلید نوسی و فەرمانی پێدا بەشێوەیەکی ئازاردەر لێی بدات. وەلید بەقامچی لێدا و خەڵکی لەنامەکەی عوسمان ئاگادار کردەوە. لەنامەکەدا هاتبو: بەشێوەیەکی جیدی لەگەڵ ئێوەدا هەڵس و کەوت دەکەم، کەواتە بەجیدی لەگەڵ خەڵك هەڵس و کەوت بکەن و لەگاڵتە و گەمە خۆتان بەدور بگرن. کەعب لەم کارە توڕەبو و دواتر لەناو ئەو کەسانەدا بینرا کەدژی عوسمان شۆڕشیان کرد. ئەو لەمباردوە بەوەلیدی وت:

| | |
|---|---|
| لعمری لئن طردتنی ما الی التی | طمعت بها من سقطتی لسبیل |
| رجوت رجوعی یا ابن اروی و رجعتی | الی الحق دهرا غال ذلك غول |
| فان اغترابی فی البلاد و جفوتی | و شتمی فی ذات الاله قلیل |
| و ان دعائی کل یوم و لیلة | علیك بدنباوندکم لطویل |

یانی:

سوێند بەگیانی خۆم، ئەگەر منت دەرکرد، تۆ بۆگەیشتن بەمەبەستەکەی خۆت کەکەوتنی منە، رێگەیەکت نیە. ئەی کوڕی ئەروی، هیواداری گەڕانەوە بوم چونکە رۆژگارێکی دورودرێژە بۆ لای راستی و دورستی گەڕاومەتەوە و شەوان و رۆژانی زۆر لەم کارە تێپەڕیوە. بێ کەس و کار مانەوەی من لەشارەکان، هەروەها بەستەم دەرکردنی من وجوێن دان بەمن، لەرێگەی خوادا کەم باییە. پاڕانەوە و دۆعاکردنی من لەتۆ لای خوا لەشەوانەرۆژدا لەدۆنباوەندەکانی ئێوە درێژ و نەمرە.

دەڵێت: بەلاّم زابی کوڕی حەرەسی بەرجەمی، داستانەکەی بەمشێوە بو کە لەرۆژگای فەرمانڕەوایی وەلید کوڕی عەقەبە، لەپیاوێك لەئەنسار بەناوی قەرحان سەگێکی

بەقەرز وەرگرت تا راوی ئاسکی پێبکات. ئەو سەگەکەی راگرت و نەیگەڕاندەوە. ئەنساریەکان بەزۆر لێیان سەندەوە و ئەو لەم هۆنراوەدا بەناشیرینی باسی ئەوان دەکات:

| | |
|---|---|
| تجشم دونی وفد قرحان خطة | تضل لها الوجناء و هی حسیر |
| فباتوا شباعا طاعمین کانما | حباهم ببیت المرزبان امیر |
| فکلبکم لا تترکوا فهو امکم | فان عقوق الامهات کبیر |

یانی:

داروەدستەی قەرحان بەدژواری پلانێکیان بۆ من دارشت کەلەزیانەکەی چوارپێی قەڵەو ئاسا دەڕزێت و گومڕا دەبێت. هەمویان شەویان بەتێری گەیاندە بەیانی وەك بڵێی فەرماندارێك لەماڵی سنورڤان پێشوازی و میوانداری لەون کردوە. ئەوە سەگەکەتان، بیگرن، چونکە دایکی ئێوەیە و نافەرمانی و خۆشنەویستی دایك گوناهێکی گەورەیە.

ئەوان لەزیانی زمانی ئەو گلەییان بردە لای عوسمان و عوسمان بەقامچی لێیدا و خستیە زیندان. ئەوەندە لەزیندانا هێشتیانەوە کەلاغر بو و گیانی سپارد. ئەو سەبارەت بەمرۆڤ کوژی داوای لێبوردنی لەهاورێکانی کرد و وتی:

| | |
|---|---|
| هممت ولم افعل و کدت و لیتنی | ترکت علی عثمان تبکی حلائله |
| و قائله قدمات فی السجن ضابی | الامن لخصم لم یجد من یجادله |

یانی:

هەوڵمدا و نەمکرد و نزیك بو دەست بەکاربم. خۆزگە ژنانی ماڵەکەی عوسمانم دەم بەگریان بەجێدەهێشت. بێژەرێك دەیوت: زابی لەزینداندا مرد. کێیە فریاڕەسێکی دادپەروەر دوژمنێك لەبەرابەر خۆیدا نابینێت تا ناسازگاری لەگەڵ بکات.

لەبەر ئەمە کوڕی عومەیر کوڕی زابی پەیوەستی سەبەئیەکان بو. بەڵام کومەیل کوڕی زیاد و عومەیر کوڕی زابی ئەم دوانە بۆ کوشتنی عوسمان بەرەو مەدینە بەرێکەوتن. عومەیر دەستی لەو کێشایەوە بەڵاك کومەیل شەڕی لەگەڵ کرد. عوسمان مشتێکی لەروخساریدا بەشێوەیەك بەقنەوە کەوتە سەرزەوی. عومەیر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئازارت بەمن گەیاند! عوسمان وتی: ئا تۆ پیاوێکی خوێنرێژیت؟

عومەیر وتی: نەبەخوا. عوسمان وتی: دادی خۆت لەمن وەربگرە ئێستا وەرە پێش چونکە من لەبەر دەستی تۆدام و کاردکانت بەڕەوا دەزانم. عومەیر لێی خۆش بو. ئەم دوانە تا رۆژگاری حەجاج مانەوە و حەجاج هەردوکیانی کوشت. بەخواستی خوا دواتر ئاماژە بەمە دەدەین.

دەڵێن: عوسمان پەنجا هەزار دردەمی کەوتە لای تەڵحە کوڕی عوبەیدالله. رۆژێك وتی: قەرزەکەتم هێناوەتەوە، وەریبگرە. عوسمان وتی: هاوکاریەك بێت بۆ تۆ لەبەرابەر پیاوەتیەکەت. کاتێك خەڵك عوسمانیان گەمارۆدا، عەلی بەتەڵحەی وت: سوێندت دەدەم تا خەڵك لەدەوری عوسمان بلاوە پێبکەیت تا لەوە زیاتر ئازاری نەدەن. تەڵحە وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم تا بەنی ئومەییە حەقی من لەخۆیان بدەن.

عوسمانیان بە (ذوالنورین) بانگ دەکرد چونکە دو کچی پێغەمبەری کردە هاوسەری خۆی.

ئەصمەعی دەڵێت: عەبدالله کوڕی عامر، قەتن کوڕی عەبدعەوف وەك فەرمانداری کرمان دەست نیشان کرد. جارێك سوپایەك لەموسوڵمانان بەرەو شوێنێك رۆشتن و لەدۆڵێك گرفتاری لافاو بون و مانەوە. قەتن ترسا دەرەنگ بکەوێت و کار لەکار بترازێت. لەبەر ئەمە وتی: هەر کەس تێپەڕێت، هەزار دردەمی پێدەبەخشم. ئەوان یەکتریان سوار کرد و تێپەڕین. چوار هەزار پیاوی شەڕکەر بون و بەوان چوار هەزار هەزار (چوار ملیۆن) دردەمی بەخشی. کوڕی عمر لەرازی بون بەم کارە خۆی بەدور گرت و ئەم هەواڵەی بۆ عوسمان نوسی. عوسمان نامەی بۆ نوسی تا ئەو برە دردەم بەقەتن بدات چونکە لەرێگەی خودا کەڵکی لێوەرگرتوە. لەو کاتەوە ئەم شێوە پاردانەیان بە(جایزە) (هۆکاری تێپەڕین) ناوبرد چونکە خەڵك لەبەر ئەوە لەدۆڵەکە تێپەڕیتن.

حسان کوڕی زەید دەڵێت: بیستم عەلی لەوتارێك بەبەرزترین دەنگ دەڵێت: ئەی خەڵکینە، سەبارەت بەمن و عوسمان زۆربڵەیی دەکەن. من و عوسمان بەو شێوەین کەخوای گەورە وتویەتی: ئەوەی رِق و کینە بو لەدڵی ئەوانمان سڕیەوە و ئەوان لەبەهشت برایانە روبەروی یەك لەسەر تەختەکان دەحەوێنەوە (حجر/١٥/٤٧).

ئەبو حەمیدی ساعدی لەشەڕکەرانی بەدر و دوژمنانی عوسمان، دوای کوشتنی ئەو وتی: سوێند بەخوا ئێمە خوازیاری کوشتنی ئەو نەبوین. ئەی خوایە, لەئەستۆی مندایە دەست لەفلاّن کار و فیسار کار هەڵگرم و بزە نەهێنمە سەر لێو تا دێمە لای تۆ.

## نەژادی ئەو تایبەتمەندیەکان و نازناوی ئەو

نەژادەکەی بەمشێوەیە: عوسمان کوڕی عەفان کوڕی ئەبی ئەلعاص کوڕی ئومەییە کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبد مەناف. دایکی ئەو ئەروی کچی کورەیز کوڕی رەبیعە کوڕی حەبیب کوڕی عەبدشەمش کوڕی عەبد مەناف. دایکی ئەم ژنە دایکی حەکیم کچی عەبدولموتەلیب بو.

تایبەتمەندیەکانی ئەو بەمشێوە بو کەدەڵێن: پیاوێك بو نەبالاّ بەرز نە کورتە بالاّ، روخۆش، پێستێکی ناسك، نیشانەی ئاوڵەی بەروخساریەوە، ریشی درێژ و پڕ، ئەسمەر، پێشە سەری تاس، جومگەی ئەستور، چوارشانە و ریشی خۆی بەرەنگی زەرد رەنگ دەکرد. دەڵێن: موی سەڕی پڕ و گەلاّوگەللّ بەرێگادا دەڕۆشت.

نازناوەکەی ئەبو عەبدالله بو. ئەم نازناوەی لەناوی کوڕەکەی لەداوێنی روقیە کچی پێغەمبەرەوە پێبڕا و ئەم کوڕە لەشەش ساڵیدا مرد. کەڵەشێرێك دەندوکی لەچاوی گرت و نەخۆش کەوت و لەمانگی جمادی الاولی ساڵی چوارەمی کۆچی /ئۆکتۆبەری ٦٢٥ زاینی مرد. هەندێك دەڵێن: نازناوەکەی ئەبو عەمرۆیە.

## سەردەمی ئیسلام و کۆچ کردنی ئەو

دەڵێن: عوسمان پێش ڕۆشتنی پێغەمبەر بۆ ماڵی ئەرقەم باوەڕی بەئیسلام هێنا. عوسمان لەو کەسانە بو یەکەم کۆچیان لەرێگەی خوادا ئەنجامدا و بۆ حەبەشە ڕۆشتن. ئەو لەدوەمین کۆچیش بۆ حەبەشە بەشداری کرد و هاوسەرەکەی رۆقیە کچی پێغەمبەری لەگەڵدا بو.

## ژنان و منداڵەکانی ئەو

ئەو لەگەڵ رۆقیە و کولسوم دو کچی پێغەمبەری خوا پەیوەندی هاوسەریەتی بەست کە رۆقیە عەبداللەی بۆ هێنایە دونیا.

هەروەها فاختە کچی غەزەوانی کردە هاوسەری خۆی کەعەبداللەی بچوکی بۆ هێنایە دنیا و ئەم منداڵە لەمنداڵیدا مرد.

لەگەڵ دایکی عەمرۆ کچی جەندەب کوڕی عەمرۆ کوڕی حەممەی دوسی پەیوەندی هاوسەری بەست و ئەم ژنە عەمرۆ و خالید و ئەبان و عومەر و مریەمی بۆ هێنایە دونیا.

لەگەڵ فاتیمەی مەخزومی کچی وەلید کوڕی موغەیرە پەیوەندی هاوسەری بەست کەوەلید و سەعید و دایکی سەعیدی بۆ هێنایە دونیا.

هەروەها لم البینینی فەزاری کردە هاوسەری خۆی و عەبدولەلیکی بۆ هێنایە دونیا کە لەمنداڵیدا مرد.

رەملە کچی شەیبە کوڕی رەبیعەی کردە هاوسەری خۆی و عایشە و دایکی ئەبان و دایکی عەمرۆی بۆ هێنایە دونیا.

هەروەها نایلەی کەلبی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و ئەو کچی فەراصفە بو و مریەمی بۆ هێنایە دونیا. دەستەیەك دەڵێن: ام البنین کچی عۆیەینە عەبدولەلیك و عەتەبەی بۆ هێنایە دونیا و نایلەی عەنەبەسەی هێنایە دونیا. ئەو لەو کچێکی بو بەناوی لم البنین و ئەم کچە بو بەهاوسەری عەبدالله کوڕی یەزید کوڕی ئەبی سوفیان.

کاتێك ئەویان کوشت، ئەم ژنانە هاوسەری ئەو بون: رەملە کچی شەیبە، نایلە، ام البنین کچی عۆیەیینە و فاختە کچی غەزەوان. کاتێك گەمارۆیان خستەسەر، لە ام البنین جیابویەوە. ئەمانە ژنان و منداڵەکانی ئەو لەرۆژگاری جاهلیدا بون.

## ناوی دەستەیەك لەفەرماندارەكانی ئەو لەم ساڵەدا

فەرماندارەكانی ئەو لەم ساڵەدا ئەمانە بون: لەمەككە عەبداللە كوڕی حەزرەمی، لەتایف قاسم كوڕی رەبیعەی سەقەفی، لەصەنعا یەعلی كوڕی مونیە، لەجەند عەبداللە كوڕی رەبیعە، لەبەسرە عەبداللە كوڕی عامر (كە لەوێ هاتەدەر و عوسمان كەسی لەم شارە دانەنا) لەشام (سوریە) معاویە كوڕی ئەبی سوفیان، فەرماندارەكانی معاویە: لەحمص عەبدولرەحمان كوڕی خالید، لەقێنسرین حەبیب كوڕی موسلیمەی فێهری، لەئەردەن ئەبو ئەعوەری سەلەمی، لەفەلەستین عەلقەمە كوڕی حەكیمی كەنانی و لەدەریا عەبداللە كوڕی قەیسی فەزاری.

كاری داوەری كردنی عوسمان لەدەستی ئەبو دەردا بو و ئەمە گێڕانەوەی دەستەیەك لەمێژونوسانە. ئەو پێش كوژرانی عوسمان لەجیهان ماڵئاوایی كرد.

فەرماندارەكانی دیكەی ئەو: لەكوفە ئەبوموسا (بۆ پێشنوێژی) لەسەر باجەكانی سواد، جابر كوڕی فلانی مەزنی خاوەنی ئاوبەستی گەورەی كەناری كوفە هاورێ لەگەڵ سەماكی ئەنساری، بۆ كاروباری شەر قەعقاع كوڕی عەمرۆ، لەقرقیسیا جەریر كوڕی عەبداللە، لەئازەربایەجان ئەشعەس كوڕی قەیسی كەندی، لەحیلوان عوتەیبە كوڕی نەهاس، لەئیسفەهان سایب كوڕی ئەقرەع، لەماسبەزان خونەیس، لەگەنجخانە عەقەبە كوڕی عامر و لەسەر دامەزراوەی داد عوسمان كوڕی زەید كوڕی سابت.

## پێشنوێژی مزگەوتی پێغەمبەر لەكاتی گەمارۆ خستنە سەر عوسمان

دەڵێن: لەو رۆژی رێگەی پێشنوێژیان لەعوسمان گرت، سەعدئەلقورەز رۆشتە لای عەلی كوڕی ئەبی تالب و پرسی: چ كەسێك لەگەڵ خەڵكدا نوێژ بخوێنێت؟ عەلی وتی: خالید كوڕی زەید بانگ بكە. زانیان مەبەستی ئەو ئەبو ئەیوبی ئەنساری خالید كوڕی زەیدە. ئەو ماوەیەك نوێژی كرد و دوای ئەوە بو بەپێشنوێژی خەڵك. دەستەیەك دەڵێن: عەلی بەسوهەیل كوڕی حەنیفی فەرمو كە لەسەرەتایی زی حەججە تا رۆژی جەژن /١٩-٩- زوئەن لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند و رۆژی جەژن عەلی خۆی لەگەڵ

خەڵك نوێژی کرد. دواتر عەلی پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد تا عوسمان کوژرا.
گێڕانەوەی دیکەیشیان ئاماژە پێداوە کەلەکاتی کوشتنی عوسمان باسمان کرد.

ئەو هۆنراوانەی بۆ مەرگی ئەو هۆنرانەوە

حەسان کوڕی سابتی ئەنسار لەپرسەکەی عوسماندا وتی:

اتركتم غزو الدروب و رائكم — و غزو تمونا عند قبر محمد
فلبئس هدى المسلمين هديتم — و لبئس امر الفاجر امتعمد
ان تقدموا نجعل قرى سرواتكم — حول المدينة كل لين مذود
او تدبروا فلبئس ما سافرتم — و لمثل امر اميركم ثم يرشد
و كان اصحاب النبى عشية — بدن تذبخ عند باب المسجد
ابكى ابا عمرو لحسن بلائه — امسى ضجيعا فلا بقيع الغرقد

یانی:

ئایا جەنگ لەشاری ناباوەڕانتان پشت گوێ خست و لەسەر ئارامگای محەممەد شەڕی ئێمەتان کرد؟ چ قوربانیەکی ناخۆشتان بۆ موسوڵمانانان هێنا و کارێکی خراپ کەخراپەکاری ئاگا لەکارەکەی خۆی کردی. ئەگەر هەنگاو بنێنە پێش، لەسەرکردەکانی ئێوە بە هەر شەڕکەرێکی چالاکی تیژپێ نەرم کردار میوانداری دەکەین و ئەگەر پشت لەشەڕ بکەن، رێگەیەکی ناڕاستتان گرتۆتەبەر و بەو رێگەی رێبەردکەتان نیشانیدان، نەڕۆشتون. وەك بڵێی شەوانە، هاوەڵانی پێغەمبەر ئەو قوربانیانە بون لەبەردەم مزگەوتا سەربڕان. بۆ باوکی عەمرۆ دەگریم چونکە ئەزمونێکی شیاوی بەسەر برد و لەئارامگای بەقیعدا جێگەی گرت و حەوایەوە.

هەروەها وتی:

ان تمس دار ابن اروى اليوم خاوية — باب صريع و باب محرق خرب
فقد يصادف باغى الخير حاجته — فيها و يهوى اليها الذكر و الحسب
يا ايها الناس ابدوا ذات انفسكم — لا يستوى الصدق عندالله و الكذب
قوموا بحق مليك الناس تعترفوا — بغارة عصب من خلفها عصب
فيهم حبيب شهاب الموت يقدمهم — مستلئما قد بدا فى وجهه الغضب

یانی:

ئەگەر ماڵی کوڕی ئەروی ئەمڕۆ چۆل بوە، ئەگەر دەرگایەك کەوتوە و دەرگایەك ئاگری گرتوە و سوتاوە، خوازیاری چاکە، نیازی خۆی لەم ماڵەدا دەبینێت و بیرەوەری چاك و پایەبەرز بەردەوام رودەکاتە ئەم ماڵە. ئەی خەڵکینە، ئەوەی لەناختاندایە ئاشکرای کەن چونکە راست و درۆ لەبەردەرگای خوا یەکسان نین. بەفەرمانی سەروەر و پاشای خەڵك هەستن تا بەهێرشە بەردەوام و دژوارەکان وەسفی ئێوە بکەن و لەبەرابەر ئێوەدا شەکەت بن. لەناو ئەوان ئاشنایەك هەیە کەوە ئاگری مەرگ لەپێش ئەوانەوە هێرش دەبات، دەمامکی لەروخسار بەستوە و توڕەیی لەروخساری دەبارێت.

هەروەها وتی:

| | |
|---|---|
| من سره الموت صرفا لامزاج له | فليات ماسدة فى دار عثمانا |
| صبرا فدى لكم امى و ما ولدت | قد ينفع الصبر فى المكروه احيانا |
| فقد رضينا باهل الشام نافرة | و بالامير و بالاخوان اخونا |
| انى لمنهم و ان غابوا و ان شهدوا | ما دمت حيا و ما سميت حسانا |
| لتسمعن و شيكا فلا ديارهم | الله اكبر يا ثارات عثمانا |
| ضحوا باشمط عنوان السجود به | يقطع الليل تسبيحا و قرآنا |

یانی:

هەر کەس شەرابی نابی تێکەڵ نەکراوی پێ خۆش بێت، دەبێت بڕوات بۆ جەنگەڵی شێران لەماڵی عوسمان، بەقوربانی ئێوە بێت دایکم و ئەوەی ئەو هێناویەتیە دونیا چونکە هەندێ کات خۆڕاگری لەشەڕێکی قورس باشترە. ئێمە بەشامیەکان رازی بون و رازین بەوەی خزمان و نزیکەکانی ئێمە بن. فەرماندارەکەی پەسەند دەکەین و برادەرانی ئەو دیارە بەبرادەری خۆمان دەزانین. من لەوانم چ لێرەبن چ لێرە نەبن تا هەر زەمانێك کەزیندو بم و تا ئەو کاتەی بەحەسان ناوم دەبەن. بەزویی لەسەرزەمینی ئەوان بانگێك بەرز دەبێتەوە: خوا گەورەیە! ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی عوسمان دەکەن، گیانی خۆتان بەقوربانی پیاوێکی مو خۆڵەمێشی بکەن کەنیشانەی نوێژ لەسەر روخساری ئاشکرایە و شەو تابەیانی لەخوا دەپارێتەوە و قورئان دەخوێنێت.

ئەبو عەمرۆ کوڕی عەبدئەلبەر کەئاماژەی بەبەشێك لەم هۆنراوەیە داوە، دەڵێت: خەڵکانی شام چەندین دێریان بەم هۆنراوەیە زیاد کرد کەبناغەیەکی راستیان نیە چونکە لەم زیاد کراوەدا هێرش کراوەتە سەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب. زیادەکە ئەمەیە:

یا لیت شعری و لیت الطیر یخبرنی ما کان بین علی و ابن عفانما

یانی: خۆزگە دەمزانی و ئەی خۆزگە باڵندەکان منیان ئاگادار دەکردەوە لەنێوان عەلی و عوسمان چی رویدا (کەعەلی قۆڵی بۆ کوشتنی ئەو هەڵکرد).

وەلید کوڕی عەقەبە کوڕی ئەبی موعیت ئەم هۆنراوەی نوسی و براکەی عومارە کوڕی عەقەبەی هاندا:

الا ان خیر الناس بعد ثلاثه قتیل التجیبی الذی جاء من مصر

فان یك طنی بابن امی صادقا عمارة لا یطلب بذحل و لاوتر

یبیت و اوتار ابن عفان عنده مخیمة بین الخورنق و القصر

یانی: بزانن دوای ئەو سێ کەسە( پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر) باشترین پیاو ئەو کەسەیە لەسەر دەستی (تەجیبی) کوژرا کە لەمیسردوە هات. ئەگەر گومانی من سەبارەت بەکوڕی دایك عومارە راست بێت، داوا لەو ناکرێت دوژمنی و تۆڵەسەندنەوە لەدڵدا پەروەردە بکات چونکە ئەو بێ ئەوەی کەس داوای لێ بکات ئەو کارە دەکات و شەو لەناو سەراپەردەکەی خۆی لەنێوان خەوەرنەق و کۆشك بەسەر دەبات بەو شێوەی کەخوێنی بێ گوناحی کوڕی عەفانی لەبەردەمدا دەبێت.

فضل کوڕی عەباس بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە:

اتطلب ثارا لست منه و لا له و این ان ذکوان الصفوری من عمرو

کما اتصلت بنت الحمار بابنه و تنسی اباها اذ تسامی اولی الفخر

الا ان خیر الناس بعد ثلاثة وصی النبی المصطفی عندذی الذکر

و اول من صلی و صنو نبیه و اول من اردی الغواة لدی بدر

فلو رات الانصار ظلم ابن امکم بزعمکم کانوا له حاضری النصر

کفی ذاك عیبا ان یشیروا بقتله و ان یسلموه للاحابیش من مصر

یانی: ئایا بەدوای خوێنێکدا دەگەڕێیت کە نەلەویت و نەبۆ ئەو! کوڕی زەکوانی

صەفوری بەعەمرۆ چی؟ بەو شێوەیە کەگەورەکان لەبەرابەر یەك شانازی بەخۆیان دەکەن و دواتر کوڕی کەڕێك بێت و باوکی پشت گوێ بخات و شانازی بەدایکیەوە بکات. دوای ئەو سێ کەسە( پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر) باشترین کەسی جێگری پێغەمبەر هەڵبژێردراوە کەشوێنکەوتوانی ئەو پشتیوانی قورئانن. یەکەم کەسە نوێژی خوێند، لقێکە لەگەڵ پێغەمبەر لەقەدێك رواوە، یەکەم کەسە لەشەڕی بەدر گومڕاکانی لەناو برد. هەرچەندە ئێوە گومان دەکەن ، ئەنسار کوڕی دایکتانی بەستەم لێکراو دەزانی، بێ درەنگ هەستان و هاوکاریان کرد. هەرئەوەندە هۆکاری شەرمەزاری بۆ ئەوان بەسە کەهاوەڵانی پێغەمبەر فەرمانی کوشتنی ئەویان دەکرد و ئەویان بەدەست (ئەحبەشەکانی) میسر سپارد.

ئەوەی وتی: کوڕی زەکوان، لەبەر ئەوەیە وەلید کوڕی عەقەبە کوڕی ئەبی موعیت کوڕی ئەبی عەمرۆ، ناوی زەکوان کوڕی ئومەییە کوڕی عەبد شەمس بو. دەستەیەك لەنەژاد ناسەکان ئەوەمان بیر دەخەنەوە کەزەکوان کویلەی ئومەییە بو و ئەوی وەك زڕ کوڕی خۆی ناو دەبرد. مەبەستی ئەم وتاردەرە ئەوەیە کەتۆ کۆیلەیەك زیاتر نیت و نەژادی ئومەوەییەکانت پێ نەبڕاوە تا لەتۆڵەستێنەکانی عوسمان بیت.

شاعیرەکان جگە لەمانە دوای کوژرانی عوسمان چەندین شێعریان هۆنیەوەتەوە. هەندێك وەسفیان کردوە و هەندێك سەرکۆنەیان کردوە. هەندێك باسی مەرگی دەکەن و دەگرین و هەندێك مژدەی ئازادیان بەیەکدا و شادیان دەربڕی. لەناو ئەو کەسانەی وەسفی دەکرد حسان کوڕی سابتە. هەروەها کەعب کوڕی مالیك و کەسانی دیکە کەوەسفیان کرد.

## بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەم ساڵەدا خەڵك لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب بەیعەتیان کرد. سەبارەت بەچۆنیەتی بەیعەت لەناو مێژوونوسان جیاوازی هەیە. دەستەیەك دەڵێن: کاتێك عوسمان کوژرا، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا لەموهاجیرەکان و ئەنسار لەدەوری تەڵحە و زوبەیر کۆبونەوە و ڕۆشتنە لای عەلی وپێیان وت: خەڵك پێویستیان بەرێبەرە. عەلی وتی: من پێویستم بەکارەکەی ئێوە نیە، هەر کەس هەڵبژێرێن پێی رازیم. وتیان: جگە لەتۆ کەس هەڵنابژێرین. چەندین جار ڕۆشتنە لای ئەو و سەرئەنجام پێیان وت: ئێمە کەس لەتۆ بەشیاوتر و لەپێشتر بۆ ئەم کارە نازانین، هیچ کەس پێشینەی باشتری لەتۆ نیە و کەس لەتۆ لەپێغەمبەر نزیکتر نیە. عەلی وتی: واز لەمن بێنن چونکە گەر وەزیربم باشترە لەوەی وەك فەرمانڕەوا بەم کارە سەرقاڵ بم. وتیان: سوێند بەخوا دەست لەتۆ هەڵناگرین تا لەگەڵ تۆ بەیعەت بکەین. عەلی وتی: ئەگەر بەم شێوەیە دەبێت لەمزگەوتا بێت چونە شیاو نیە بەیعەت لەگەڵ من بەشێوەیەکی نهێنی ئەنجام بدرێت. ئەم بەیعەتە دەبێت تەنیا لەمزگەوتا بکرێت. ئەو لەماڵەکەیدا بو. دەستەیەك دەڵێن: لەباخەکەی بەنی عەمرۆ کوڕی مەبزولدا بو. عەلی بەرەو مزگەوت ڕۆشت، پانتۆڵێکی لەپێ ودەستارێکی هەوریشمی لەسەر. پێڵاوەکانی دەرهێنا وبەدەستیەوە گرت و پاڵی بەکەوانێکەوەدا و خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ کرد. یەکەم کەس دەستی بردە پێش و بەیعەتی لەگەڵ کرد، تەڵحە کوڕی عوبیدالله بو. حەبیب کوڕی زوەیب سەیری دەکرد و وتی: پەنا بەرخوا! یەکەم کەس دەستی درێژبو گۆج بو. ئەم کارە بەکۆتایی ناگات! دواتر زوبەیر بەیعەتی لەگەڵ کرد. عەلی بەم دوانەی وت: ئەگەر دەتانەوێت بەیعەت لەگەڵ من بکەن و ئەگەر ناتانەوێت من بەیعەت لەگەڵ ئێوە دەکەم. وتیان: بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکەین. ئەم دوانە دواتر وتیان: لەترسی گیان بەیعەتمان لەگەڵ عەلی کرد چونکە دەمانزانی ئەو بەیعەت لەگەڵ ئێمە ناکات. زوبەیر و تەڵحە چوار مانگ دوای کوژرانی عوسمان بۆ مەککە هەڵاتن. خەڵك هاتن و هەموویان بەیعەتیان کرد. سەعد کوڕی ئەبی وەقاصیان هێنا، عەلی پێی وت: بەیعەت بکە. وتی نایکەم تا خەڵك هەموی بەیعەت بکەن، سوێند بەخوا لەلایەن منەوە ترست لەسەر نیە. عەلی وتی: رێگە بدەن

با بڕوات. کوڕی عومەریان هێنا و وتیان: بەیعەت بکە. وتی: نایکەم تا خەڵك بەیعەت بکەن. عەلی وتی: کەسێك بکەرە دەستەبەری خۆت. وتی: کەس ناناسم. مالکی ئەشتەر وتی: رێگە بدە لەملی بدەم. عەلی وتی: وازی لێ بێنن من دەبمە دەستەبەری ئەو. ئەی ئەشتەر، لەو کاتەوەی لەبیرمە بەمناڵی و گەورەیی کەسێکی توندوتیژ بویت.

ئەنصار جگە لەچەند کەسێك بەیعەتیان کرد. ئەوانەی بەیعەتیان نەکرد ئەمانە بون: حسان کوڕی سابت، کەعب کوڕی مالك، موسلیمە کوڕی موخەلەد، ئەبو سەعیدی خدری، محەممەد کوڕی موسلیمە، نەعمان کوڕی بەشیر، زەید کوڕی سابت، رافع کوڕی خەدیج، فەزالە کوڕی عوبەید و کەعب کوڕی عەجرە. ئەوانە لایەنگرانی عوسمان بون. حسان کوڕی سابت پیاوێکی شاعیر و ترسی لەهەڵس و کەوت و کرداری خۆی نەبو. عوسمان زەید کوڕی سابتی لەسەر دەبیرخانەکەی خۆی و گەنجینە دانا. کاتێك گەمارۆیان خستە سەر عوسمان، دوجار وتی: ئەی ئەنصاریەکان، هاوەڵانی خوا بن. ئەبو ئەیوب پێی وت: تۆ تەنیا لەبەر ئەوە هاوکاری دەکەیت چونکە کۆیلەی زۆری پێبەخشیویت. عوسمان کەعب کوڕی مالیکی وەك سەرپەرەستی زەکاتی مەدینە دانا لەسەر ئەو بنەمایی هەرچی کۆبکاتەوە تەسلیمی ئەو بکات. هەروەها لەوکەسانەی بەیعەیتان نەکرد: عەبداللە کوڕی سەلام، صۆهەیب کوڕی سەنان، سەلە کوڕی سەلامە، کوڕی وەقش، ئوسامە کوڕی زەید، قودامە کوڕی مەزعون و موغەیرە کوڕی شەعبە. نەعمان کوڕی بەشیر چەنجە بڕاوەکانی نایلە هاوسەری عوسمان و کراسی خوێناوی عوسمانی هەڵگرت وبۆ شام هەڵات. معاویە کراسەکەی عوسمانی بەو پەنجانەوە هەڵدەواسی و کاتێك خەڵکانی شام ئەمەیان دەبینی، زیاتر تورە دەبون و بۆ شەڕ وئاژاوە زیاتر هەوڵیان دەدا. کاتێك سستی ولاوازی لەوان دەبینی، بەعەمرۆ کوڕی عاصی دەوت: کەمێك لەخەمەکانی بیربخەرەوە تا پەرێشان بێت.

دەستەیەك دەڵێن: زوبەیر و تەڵحە بەزۆر و لەترسی عەلی بەیعەتیان کرد. دەستەیەك دەڵێن: زوبەیر و صۆهەیب و سەلە کوڕی وەقش و ئوسامە کوڕی زەید بەیعەتیان نەکرد. لەسەر بنەمای گێڕانەوەی کەسێك کەدەڵێت: زوبەیر ر تەڵحە بەزۆر بەیعەتیان کرد، دەوترێت: کاتێك عوسمان کوژرا، مەدینە بۆ ماوەی پێنج رۆژ بێ سەرەوبەرە و بێ سەرپەرەست مایەوە و فەرماندارەکەی غافقی کوڕی حەرب بو.

ئاژاوەچیەکان بەدوای کەسێکدا دەگەڕان تا بانگەوازەکەیان وەڵام بداتەوە و بەکاری فەرمانڕەوایی رازی بێت. بەڵام کەسیان دەست نەدەکەوت. بینیان تەڵحە بەرەو باخەکەی خۆی ڕۆشتوە و سەعد کوڕی وەقاص و زوبەیر لەمەدینە ڕۆشتونەتەدەر و ئومەوییەکان هەمویان هەڵاتون و تەنیا ئەوانە ماونەتەوە کەتوانایی هەڵاتنیان نەبوە. سەعید کوڕی عاص و وەلید کوڕی عەقبە و مەروان کوڕی حەکەم بۆ مەککە هەڵاتبون وکەسانیتر بەدوای ئەواندا ڕۆشتبون. میسریەکان ڕۆشتنە لای عەلی و عەلی ئەوانی لەخۆی دور خستەوە. خەڵکانی بەسرە ڕۆشتنە لای تەڵحە و تەڵحە ئەوانی لەخۆی دور خستەوە و خەڵکانی کوفە ڕۆشتنە لای زوبەیر و زوبەیر ئەوانی گەڕاندەوە. شورشگێران لەسەر کوشتنی عوسمان یەکگرتو بون بەڵام لەسەر ئەوەی چ کەسێك جێگەی ئەو بگرێتەوە، ناسازگار بون. کەسیان بەدوای سەعد کوڕی وەقاصدا رەوانە کرد و بەدوایدا گەڕان. وتی: من و عەبدالله کوڕی عومەر پێوستمان بەم کارە نیە. ڕۆشتنە لای کوڕی عومەر و رازی نەبو. لەبەر ئەمە سەرگەردان مانەوە و بەیەکیان وت: ئەگەر خەڵك بێ دیاری کردنی خەلیفە بۆ شارەکانی خۆیان بگەڕێنەوە، لەبەربلاّوی خەڵك وگومڕایی ئۆمەت ئاسودە نابین. خەڵکانی مەدینەیان کۆکردەوە و بەوانیان وت: ئەی خەڵکانی مەدینە، ئێوە خاوەن بۆچونەکان وپاسەوانانی راوێژ کردنن، ئێوە رێبەر دەست نیشان دەکەن و فەرمانی ئێوە لەناو خەڵکدا رەوایە. کەسێك هەڵبژێرن وبیکەنە خەلیفە و ئێمە شوێنکەوتەیی ئێوەین. ئەمڕۆ مۆڵەتتان پێ دەدەین، سوێند بەخوا ئەگەر تا بەیانی ئەم کارە ئەنجام نەدەن، بێ گومان عەلی و تەڵحە و زوبەیر و کەسانی زۆر دەکوژین. خەڵك ڕۆشتنە لای عەلی و وتیان: ئێمە لەگەڵ تۆ بەیعەت دەکەین چونکە دەبینی چ بەڵایەك بەسەر ئیسلامدا هاتوە و ئێمە لەناو خەڵکی شارەکان بەچیەوە گرفتار بوین. عەلی وتی: واز لەمن بێنن و بەدوای کەسێکی دیکەدا بگەڕێن چونکە بەکارێکەوە گیرۆدەین روخسار و رەنگی جۆراوجۆری هەیە. دڵەکان لەسەر ئەم کارە ئارام ناگرن و ئاوزەکان بەهێز نابن. پێیان وت: تۆ بەخوا سوێند دەدەین! مەگەر نابینی چی بەسەر ئەم خەڵکەدا هاتوە؟ ئیسلام نابینی؟ ئاژاوە نابینیت؟ لەخوا ناترسیت؟ عەلی وتی: من بەداواکەی ئێوە رازی بوم بەڵام بزانن ئەگەر بێمە سەر کار بەشێوەیەك رێبەری ئێوە دەکەم کەخۆم دەزانم و دەمەوێت. ئەگەر رێگەم بدەن وەك یەکێك

لەئێوەبم. من گوێڕایەڵترین و فەرمانبەردارترینی کەسێك دەبم کەهەڵیدەبژێرن. ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە بڵاوەیان لێکرد و بەڵێنی کۆبونەوەیان لەبەیانیدا.

خەڵك لەناو خۆیاندا راوێژیان کرد و وتیان: ئەگەر زوبەیر و تەڵحە بەم کارە رازی بن، کێشەی تیا دروست نابێت. خەڵکانی بەسرە حوکەیم کوڕی جەبەلەیان بۆ لای زوبەیر رەوانە کرد و وتیان: لەگەڵ ئەو بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس وکەوت مەکە. ئەویان هێنا و بەردەوام بەشمشێر دەیانترساند. زوبەیر بەیعەتی کرد. مالکی ئەشتەر و چەند کەسێکیان بۆ لای تەڵحە رەوانەکرد. مالك ڕۆشتە لای تەڵحە و ئەو وتی: بابزانم خەڵك چی دەکەن. مالك ئەوی ئازاد نەکرد. بەریسوایی و بەدزواری هێنای. تەڵحە لەگەڵ عەلی بەیعەتی کرد. زوبەیر دواتر دەیوت: دزێك لەدزەکانی عەبدئەلقەیس هاتە سەر سەرم و من کاتێك بەیعەتم کرد شمشێر لەسەر ملم بو. خەڵکانی میسر لەوەی خەڵکانی مەدینە هەڵیانبژارد، شادمان بون. خەڵکانی کوفە و بەسرە لەوەی بونە شوێنکەوتەیی میسریەکان، ناڕاحەت و خەمبار بون و بەردەوام دەیانبۆڵاند. ڕق و تورەیی ئەوان لەزوبەیر و تەڵحە زیادی کرد.

کاتێك هەتاوی بەرەبەیانی هەینی، ڕۆژی پەیمان بەستن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب سەری لەماڵەکەی دا، خەڵکان ڕۆشتنە ناو مزگەوت. عەلی هات و ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: ئەی خەڵکینە، لەبەرابەر هەموان و بەفەرمانی خۆتان بەئاشکرا دەڵێم ئەم کارە تایبەتە بەئێوە و جگە لەوەی ئێوە فەرمانی پێبدەن، هیچ کەسێکی دیکە ماف نیە. دوێنێ ئێمە لەسەر بنەمای پەیمانێك لەیەك جیابوینەوە. من فەرمانڕەوایی بەسەر ئێوە پەسەند ناکەم بەڵام ئێوە بەمە رازی نەبون و دەتانەوێت من ڕێبەری ئێوە بم. ئاگادار بن من لەم ناوەدا جیاواز لەئێوە، جگە لەو کلیلانەی ئێوەی، هیچم بەدەستەوە نیە و شیاو نیە بێ ئێوە درەمێك هەڵبگرم. ئەگەر بتانەوێت دادەنیشم و کینە و ڕق یا گلەییم لەکەس نیە. وتیان: ئێمە لەسەر پەیمانەکەی خۆمان سورین و لەسەر ئەو بنەماییە لەیەك جیابوینەوە. عەلی وتی: خوایە شایەت بە. کاتێك تەڵحەیان بۆ بەیعەت هێنا، وتی من بەزۆر بەیعەت دەکەم. دەستی گۆج بو. پیاوێك بەداخەوە و درێغەوە وتی: پەنا بەخوا! هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). یەکەم کەس دەستی بۆ بەیعەت دان درێژ کرد، گۆج بو. ئەم

کارە بەکۆتایی ناگات. زوبەیر کوڕی عەوامیان هێنا و ئەویش هەمان قسەی کرد و بەیعەتی دا. سەبارەت بەبەیعەتی زوبەیر گێڕانەوەکان فراوانن. دوای ئەوە خەڵکانێکیان هێنا خۆیان دور خستبویەوە. وتیان: بەیعەت دەکەین لەسەر جێگیر کردنی نوسراوی خوا سەبارەت بەنزیك و دور و ڕێزدار و بێ ڕێز. عەلی لەگەڵ ئەوان بەیعەتی کرد. دواتر دەستەکانی خەڵکی مەدینە هاتن و بەیعەتیان کرد. دوبارە کاروبارەکان کەوتە دەست خەڵکانی مەدینە و ئەمان وەك رابردویان لێهاتەوە. هەموان بڵاوەیان لێکرد و بۆماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە.

رۆژی هەینی پێنج رۆژ بۆ کۆتایی مانگی زی حەجحە /٢٤ ژوئەنی ٦٥٦ زایینی خەڵك لەگەڵ عەلی بەیعەتیان کرد. خەڵك بەیعەت لەگەڵ ئەویان لەرۆژی کوژرانی عوسمانەوە لەقەڵەمدا.

عەلی لەیەکەم وتاری خۆی دوای گەشتن بەرێبەرایەتی، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: خواوەند نوسراوێکی ناردوە کەرێبەری نێوان چاکە و خراپەیە. چاکیەکان هەڵبگرن و خراپیەکان لەخۆتان دور بکەنەوە. کارە پێویستەکان بەجێ بێنن، کارە پێویستەکان ئەنجام بدەن. ئەو کارانە بگەیێنە بارەگایی خواوەند تا ئێوە بۆ بەهەشت رێنوێنی بکات. خوا چەندین کاری نارەوا کردوە کە لەکەس داپۆشراو نیە بەلأم ئەو رێز گرتنی خوا باوەڕی پێش هەر کارێکی پێویست و ناپێویست خستوە. ئەو سەبارەت بەتایبەت کردنی کارەکان بۆ خواوەند و باوەڕ کردنی ئەو بەتاقانەیی و رێز گرتن لەماف موسوڵمانانی، جەختی کردۆتەوە. موسوڵمان ئەو کەسەیە موسوڵمانان لەدەست و زمانی ئەو ئاسودە بن تەنیا لەکارە راست و دروستەکاندا نەبێت. خوێنی هیچ موسوڵمانێك نابێت و نەشیاوە بۆ ڕشتن مەگەر ئەوەی ئەم کارە لەرێگەی خوادا بگرێت و پێویست بێت. کاری خەڵکان پێش هەر کەسێکی دیکە ئەنجام بدەن و بزانن ئەوەی تایبەت بەهەرکام لەئێوەیە، مەرگە. خەڵك روبەروی ئێوەن و رۆژی کۆتایی لەپشت سەری ئێوە و بانگتان دەکات. بار سوك بن تا بەکاروانی رزگاری بگەن. خەڵکان بەردەوام چاوەڕوانی کۆتایی کارەکانی خۆیان دەکەن. ئەی بەندەکانی خوا، لەخوا سەبارەت بەبەندەکان و شارەکانی ئەو خۆتان بەدور بگرن. ئێوە لێکۆڵینەوەتان سەبارەت بەئاژەڵەکان و سەرزەمینەکانیش لەگەڵ دەکرێت. لەخوا فەرمان ببەن و لە دەرگای ئەو

گوناح مەکەن. ئەگەر چاکەتان بینی، فێری ببن و کاتێك خراپەتان بینی، خۆتانی لێ بەدور بگرن. ((ئەو کاتە بیر بێننەوە کەکەم و زمان گیراوەکانی سەرزەمین بون) (ئەنفال /٨/٢٦). کاتێك لەوتارەکەی تەواو بو، سەبەئیەکان ئەو کاتەی عەلی لەسەر تەختەکەی بو، وتیان:

| | |
|---|---|
| حذها اليك احذرن ابا حسن | انا نمر الامر امرار الرسن |
| صولة اقوام كاشداد السفن | بمشرفيات كغدران اللبن |
| و نطعن الملك بلين كالشطن | ختى يمرن على غير عنن |

یانی: ئەی باوکی حەسەن کاروبارەکان بگرە دەست و ئاگادار بە. ئێمە کارەکان وەك تەنافێك تێپەر دەکەین. هاوشێوەی کەشتیەی کێو ئاساکان هێرش دەکەین و بەتیغە سپیەکان هاوشێوەی شێرەکان هێرش دەکەینە سەر دوژمنان. بەرمە بڵند و نەرمەکان وەك تەناف هێرش دەکەینە سەرپاشاکان تا بێ سستی و لاوازی لەجەرگی ئەوانەوە تێپەڕێت.

عەلی وتی:

| | |
|---|---|
| انی عجزت عجزة لا اعتذر | سوف اكيس بعدها و استمر |
| ارفع من ذيلى ما كنت اجر | و اجمع الامر الشتيت المنتشر |
| ان لم يشاغبنى العجول المنتصر | ان تتركونى و السلاح يبتدر |

یانی: من یەك جار چاوپۆشیم کرد بەڵام داوای لێبوردن ناکەم. دوای ئەوە بەردەوام چالاك و زیرەك دەبم و لەسەر ئەمە دەمێنمەوە. ئەوەی لەدوایێنمدایە، دەیوەشێنم و کارە بەربلاو و پەرێشانەکان کۆدەکەمەوە. ئەگەر بەپەلەی سەرکەوتو لەمن نەئاڵێت و ئەگەر رێگە بدەن کەرەستەی شەڕ بەردەوام لەدەستی مندا بێت.

عەلی بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە. زوبەیر و تەڵحە و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر رۆشتنە لای و وتیان: ئەی عەلی، ئێمە لەبەردەم خەڵکدا پەیمانمان بەست پاداشت و سزای دینی بەکار ببەین. ئەم کەسانە دەستیان بەخوێنی ئەم پیاوە پیس کردوە و ئەم گرفتاریەیان بۆ خۆیان دروست کردوە. عەلی وتی: ئەی برادەران، لەوەی ئاگادارن، نائاگا نیم بەڵام لەگەڵ ئەم خەڵکەی کە بەسەر ئێمە زاڵن و ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵ نین،

دەتوانم چی بکەم؟ ئەمانە ئەو کەسانەن لەگەڵ کۆیلەکانی ئێوە راپەڕیون. بیابان نشینەکانی ئێوە پەیوەستیان بون و ئەوان تێکەڵەیەك لەئێوەن و هەرچیان بوێت لەگەڵ ئێوە دەیکەن. ئایا بۆ ئەوەی داوای دەکەن، شوێنێك بۆ هێز وەرگرتن دەبینن؟ وتیان: نە. وتی: کەواتە سوێند بەخوا، جگە لەوەی ئێوە پەسەندی نەکەن، هیچ بۆچونێکی دیکەم نابێت جگە لەوەی خوا بیەوێت. ئەم کارە، کارێکە لەرۆژگاری جاهلیەوە ماوەتەوە و لەناو ئەم خەڵکەدا ڕەگ و ریشەیەکی قوڵی هەیە. داستان بەمشێوەیە کەدێو بناغەی هیچ ئایینێکی دانەڕشت مەگەر ئەوەی هەر کەسێك فێری بو، هەرگیز نەیتوانی لەپێبەستەکەی لەسەر زەوی تەکان بخوات. خەڵك لەبەرابەر ئەم کارە (ئەگەر بوروژێنرێت) چەندین دەستەن. دەستەیەك وەك ئێوە بیر دەکەنەوە و دەستەیەك پێچەوانە و دەستەیەك هیچیان. بەمشێوەیە تا خەڵك ئارام بگرن ودڵەکان بگەڕێنەوە سەر جێگەی خۆیان و مافەکان وەربگیرێنەوە. لەدەوری من بڵاوەی لێبکەن و ئارام بگرن و چاوەنوار بن تا چ فەرمانێك بەئێوە دەگات و دواتر بۆ لای من بگەڕێنەوە. عەلی تەنگی بەدەستەیەك لەقوڕەیشیەکان هەڵچنی و رێگەی نەدا بەهەمان شێوەی کەهەن لەمەدینە بڕۆنەدەر. ئەوەی عەلی تورە کرد، هەڵاتنی ئومەوییەکان و بڵاوبونەوەی دەستەیەك لەخەڵکان بو. خەڵك سەبارەت بەم کردەوە بەشێوەی جیاواز قسەیان کرد و کرداری جیاوازیان گرتەبەر. دەستەیەك لەوتەکانی عەلی پشتیوانیان کرد و دەستەیەك وتیان: ئەوەی لەئەستۆی ئێمەدا ئەنجامی دەدەین و پشت گوێی ناخەین. سوێند بەخوا عەلی باوەڕێکی دژوار و جیاوازی هەیە و گوێ لەقسەی کەس ناگرێت و ئامۆژگاری کەس بەکار نابات، لەبەر ئەمە زیاتر لەپێشینانی خۆی تەنگ بەقوڕەیشیەکان هەڵدەچنێت.

عەلی ئەم قسانەی بیست و قسەی بۆ ئەوان کرد و لەپیشی ئەوانی بیر خستەوە و پێویستیەکانی خۆی بەوان گەیاند و وتی سەیری ئەوان دەکات و رێزیان لێ دەگرێت و کارەکانی ئەوان ئەنجام دەدات و لەبەر ئەمە، لەفەرمانڕەوایی کردن بەسەر ئەوان تەنیا ئەمەی بەدەستەوە دەبێت و جگە لەپاداشتی خوایی چاوەڕوانی هیچی دیکە ناکات. ئەو فەرمویی و جاڕیاندا: ئەمان لەسەر کۆیلەیەك هەڵگیراوە کە بۆ لای خاوەنەکەی نەگەڕێتەوە. سەبەئیەکان و بیابان نشینەکان تورە بون و وتیان: بەیانی پەیامێکی هاوشێوەی ئەمە لەزیانی ئێمە دەردەکات و ئێمە ناتوانین بۆ هیچ کام زمان بکەینەوە و

قسە بکەین. عەلی فەرموی و جارپاندا: ئەی خەڵکینە، بیابان نشینەکان لەخۆتان دور بکەنەوە تا بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. سەبەئیەکان بەمە رازی نەبون و بیابان نشینەکان لایەنگریان لێکردن. عەلی ڕۆشتە ناو ماڵەکەی خۆی و زوبەیر و تەڵحە کوڕی عوبەیدالله و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ڕۆشتنە لای. عەلی وتی: ئێستا ئەو خوێنەی داواتان دەکرد، ئەوان بکوژن. وتیان: لەم کارە خۆیان بەدور دەگرن. عەلی وتی: سوێند بەخوا لەمەدوا بەهێزە سەرپێچی فەرمانەکان دەکەن. دواتر وتی:

و لو ان قومی طاوعتنی سراتهم امرتهم امرا یدیخ الا عادیا

یانی: ئەگەر گەورەکانی خەڵکەکەم فەرمانیان لێدەبردم، فەرمانم بەوان دەدا تا دوژمنان رام و ریسوا بکات.

تەڵحە پێی وت: ڕێگە بدە بڕۆمە بەسرە تا هەر ئەوەندە فەرمان بدەیت، لەچاو تروکانێکدا بەسوپایەکی گەورە بێمە لای تۆ. زوبەیر وتی: ڕێگە بدە بڕۆمە کوفە ( و فەرمانداری ئەوێ بم) تا ئەگەر پێویستت بو، بەسوپایەکی گەورە بێمە لای تۆ. عەلی وتی: با بزانم.

دەڵێن: عەبدالله کوڕی عەباس وتی: دوای کوژرانی عوسمان، لەمەککە گەڕامەوە و ڕۆشتمە لای عەلی و بینیم موغەیرە کوڕی شەعبە بەتەنیا لەگەڵ ئەو دانیشتوە. موغەیرە لای ئەو ڕۆشتەدەر. پێم وت: ئەم پیاوە چی بەتۆ وت؟ عەلی وتی: پێشتر هاتە لام و وتی: تۆ لەئەستۆی مندا مافی فەرمانبرداری و چاکەخوازیت هەیە و تۆ یادگاری بەجێماوی پێشینانی ڕێزداری. بۆچونی راستی ئەمڕۆ، کاری بەیانی بەهێز دەکات و بۆچونی وێرانکەری ئەمڕۆ، کاری بەیانی پێشێل دەکات. معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و عەبدالله کوڕی عامر و فەرماندارەکانی عوسمان لەسەر کارەکانیان بهێڵەرەوە تا هەواڵی بەیعەت کردنی ئەوان بەتۆ بگات و خەڵك ئارام بگرن. دواتر هەر کەسێکت ویست، لەسەر کار لایبەرە. من بەم پێشنیارەی موغەیرە رازی نەبوم و وتم: لاوازی لەدینەکەم ناکەم و بەم ریسواییە رازی نابم. موغەیرە وتی: ئەگەر بەوتەکەی من رازی نابیت، هەر کەست پێخۆشە لەسەر کار لایبەرە بەڵام معاویە نا چونکە ئەو پیاوێکی بوێر و بەئەزمونە. ئەو لەسەراسەری شام فەرمانڕەوایە و تۆ بۆ هێشتنەوەی ئەو بەڵگەیەکت

هەیە چونکە عومەریش ئەوی لەسەر کار هێشتەوە. بەموغەیرەم وت: سوێند بەخوا تەنانەت ڕێگە نادەم معاویە دو ڕۆژ لەسەر کارەکەی بمێنێتەوە! دواتر موغەیرە لای من ڕۆشت و دەمزانی حەزی دەکرد هەڵە بکەم و لەباوەڕی بەهێزی خۆم پەشیمان ببمەوە. ئێستا، ئەمجارە موغەیرە هاتە لام و وتی: جاری یەکەم، ئەوەی دەزانی بەتۆم وت و تۆ لەراوێژ کردن لەگەڵ من خۆت بەدور گرت. دوای ئەوە بەباشم زانی ئەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدەیت و ئەوان لەسەر کار لابەریت و داوای هاوکاری لەکەسانی دیکە بکەیت و ئەوانە باوەڕت پێیانە وەك فەرماندار دەست نیشان بکەیت. خوا هاوکاری تۆیە وبۆ تۆ بەسە و ئەمانە لەوەی گومان دەکرێت، شکۆ و مەزنی کەمتریان هەیە. عەبدالله کوڕی عەباس دەڵێت: بەعەلیم وت: یەکەم جار موغەیرە چاکەی تۆی دەویست و جاری دوەم فریوی دایت. عەلی وتی: بۆ چاکەخوازی من بو؟ وتم: چونکە معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و هاوەڵانی ئەم دنیایە دەپەرەستن و ئەگەر تۆ ئەوان بهێڵیتەوە، ترسی ئەوەیان نیە کێ خەلیفە و فەرمانڕەوایی موسوڵمانانە بەڵام ئەگەر لەسەر کار لایان ببەیت، دەڵێن: عەلی بێ راوێژ کردن بەموسوڵمانان فەرمانڕەوایی گرتە دەست و عوسمانیشی کوشت. دژی تۆ شۆڕش دەکەن و خەڵکی عێراق و شام دژی تۆ هان دەدەن. منیش بۆچونم وایە معاویە لەسەر کارەکەی بهێڵیتەوە. ئەگەر لەگەڵ تۆ بەیعەتی کرد لەئەستۆی مندا بێت ئەو لەماڵەکەی دور بکەمەوە. عەلی وتی: جگە لەنوکی شمشێر بەو نادەم! دوتار ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

وما میتة ام متها غیر عاجز      بعار اذا ما غالت النفس غولها

یانی: بەرگێگ کە لەروی سستی و لاوازیەوە نەیێت و من لەکارەکەی خۆمدا هەوڵی پێویستم دابێت، شەرمێنەر نیە.

من (عەبدالله کوڕی عەباس) بەعەلیم وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ پیاوێکی دلێریت بەڵام لەکاروباری شەڕ و وڵات بەرێوبردن هیچ نازانیت. نازانی کەپێغەمبەری خوا وتی: کاری شەڕ بەفزیو راست دەکرێتەوە؟ عەلی وتی: بەڵێ دەزانم. بەعەلیم وت: سوێند بەخوا ئەگەر بەقسەکانی من رازی ببیت، بەنەرمی ئەوان دەبەمە سەر کانی و بەزیرەکی دەیانهێمەدەر و بەشێوەیەك بەرەڵایان دەکەم بەردەوام لەکۆتایی کارەکانن بڕوانن و نەزانن بەکام لادەگات. ئەم کارە ئەوەندە بەباشی ئەنجام دەدەم هیچ گوناح و

ناپاکیەك داوێنی تۆ نەگرێتەوە. عەلی وتی: ئەی کوڕی عەباس، من لەرەخنە گرتنەکانی کەسانێکی وەك تۆ یا معاویە هیچ ترسێکم نیە. کوڕی عەباس دەڵێت: بەعەلیم وت: گوێ لەئامۆژگاریەکانی من بگرە و بڕۆ بۆ دێهاتەکەی خۆت لە(یەنبەع) و دەرگا لەسەر خۆت دابخە چونکە عەرەبەکان هێرش بەم لاولادا دەکەن و دواتر جگە لەتۆیان دەست ناکەوێت و بۆ لای تۆ دەگەڕێنەوە. سوێند بەخوا ئەگەر کاروباری ئەم خەڵکە لەدەست بگریت، بەیانی خراپەخوازان و خراپەکاران خوێنی عوسمان دەخەنە ئەستۆی تۆ. عەلی بەوتەکانی من رازی نەبو و وتی: تۆ ئامۆژگاریەکانی خۆت بڵێ بەلام ئەگەر نافەرمانی تۆم کرد تۆ فەرمانبردار بە. دەڵێت: وتم: ئەو کارە دەکەم. ئاسانترین داواکاری تۆ لای من فەرمانبردنی تۆیە. عەلی وتی: بڕۆ بۆ شام چونکە تۆم کردوە بەفەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە. کوڕی عەباس وتی: ئەم بۆچونە راست نیە. معاویە پیاوێك لەئومەوییەکانە و کوڕە مام و فەرمانداری عوسمانە و دەترسم من لەجیاتی خوێنی عوسمان بکوژێت. کەمترین کار ئەنجامی بدات ئەوەیە من بخاتە زیندان و بەهۆی خزمایەتی من لەگەڵ تۆ کارە گرانەکان بخاتە ئەستۆی من. هەرچی کەوتە ئەستۆی تۆ، یەخەی منیشی گرتوە. باشترە نامەیەك بۆ معاویە بنوسیت و بیبەخشیت و مژدەی پێ بدەیت.

عەلی وتی: سوێند بەخوا هیچ کات ئەمە رونادات.

موغەیرە دوای ئەوە دەیوت: چاکەخوازی ئەو بوم و کاتێك رازی نەبو، فریومدا. ئەو لەمەدینە ڕۆشتەدەر و رۆی بۆ مەککە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا یانی ٦٥٥/٣٥—٦٥٦ زایینی کۆنستانتین کوڕی هراکلیوس بەهەزار کەشتی شەرکەر ئاهەنگی سەرزەمینی موسوڵمانانی کرد و ئەمە پێش کوژرانی عوسمان بو. خواوەند بایەکی بەسەردا هەڵکردن و ئەوانی لەئاودا خنکاند. کونستانتین رزگاری بو و رۆشتە دورگەی سیسیل. گەرماوێکیان بۆ دروست کرد و ڕۆشتە ناوی و رۆمیەکان بەدوای ئەودا ڕۆشتنە ناو و کوشتیان و وتیان: خەڵکەکەی ئێمەت لەناو برد. ئەبوجەعفەری تەبەری بەمشێوەیە ئاماژەی پێداوە.

ئەم کۆنستانتینە ئەو کەسەیە موسوڵمانان لەشەڕی صەواری لەساڵی ٣١/٦٥٢ شکەستیاندا. خەڵکی سیسیل ئەویان لەناو گەرماوێکدا کوشت هەرچەند سەبارەت بەساڵی رووداوەکە بەجیاوازی قسەیان کردوە. ئەگەر ئەبو جەعفەری تەبەری ئەیوتبو کەشتیەکان لەناودا نوقم بون و لەناوچون، هەمان روداو دەبو چونکە دەستەیەك گومان دەکەن ئەم روداوە لەساڵی ٣٥/٦٥٥ ٦٥٦ رویداوە.

لەرۆژگاری خەلافەتی عوسمان ئەم کەسانە مردن: ئەوس کوڕی خەولی ئەنساری، جەلاس کوڕی سوەیدی ئەنساری لەهەڵگەڕاوەکان لەرۆژگاری پێغەمبەر کەدواتر تۆبەی کرد، حەرەس کوڕی نەوفل کوڕی حەرەس کوڕی عەبدولموتەلیب کەنازناوی باوکی (بەببە)یە، حەکەم کوڕی ئەبی عاص باوکی مەروان کوڕی حەکەم و مامی عوسمان (لەکۆتایی ئەم ساڵەدا) حەبان کوڕی مونقزی ئەنساری باوکی یەحیا کوڕی حەبان، عەبداللە کوڕی قەیس کوڕی خالیدی ئەنساری کەدەستەیەك وتویانە لەشەڕی ئۆحۆد کوژرا، قوتەبە کوڕی عامری ئەنساری لەئامادەبوانی عەقەبە و لەشەڕکەرانی بەدر، زەید کوڕی خارجە کوڕی زەیدی ئەنساری کەدوای مەرگی خۆی قسەی کرد، مەعبەد کوڕی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب کە لەکۆتایی خەلافەتی عوسمان لەئەفریقیە کوژرا، موعەیقیب کوڕی ئەبی فاتیمە لەکۆچکەران بۆ حەبەشە کەهەڵگری مۆری پێغەمبەریش بو و دەستەیەك وتویانە لەساڵی ٤٠/٦٦٠ زایینی کۆچی دوایی کرد و ئەمە لەرۆژگاری خەلافەتی عەلی بو، موتیع کوڕی ئەسوەدی عەدەوی کە لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنا، نوعەیم کوڕی مەسعودی ئەشجەعی کەدەستەیەك دەڵێن رۆژی شەڕی (وشتر) لەگەڵ موجاشیع کوڕی مەسعود کوژرا، عەبداللە کوڕی حوزافەی سەهمی لەبەدریەکان کەپیاوێکی گاڵتەچی بو، عەبداللە کوڕی ئەبی رەبیعەی مەخزومی باوکی عومەر کوڕی عەبداللەی وتاردەر کە لەکاتی گەمارۆدرانی عوسمان لەیەمەنەوە بۆ هاوکاری هات بەڵام لەچوارپێکەی کەوتە خوار و مرد، ئەبو رافیع کۆیلەی پێغەمبەر کەدەستەیەك دەڵێن لەرۆژگاری خەلافەتی عەلی مرد و ئەمە راسترە، ئەبو سەبرە کوڕی ئەبی رۆهمی عامری لەعامر کوڕی لۆئەی لەشەڕکەرانی بەدر، هاشم کوڕی عەتەبە کوڕی رەبیعە خاڵی معاویە کە لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی بەئیسلام هێنا و پیاوێکی چاکەکار بو و ئەبودەرئ کەدەستەیەك دەڵێن: دوای عوسمان ژیا بەڵام وتاری یەکەم راسترە.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زامیر محەمەد رەشید

بەرگی پێنجەم

سلێمانی

٢٠١٢

# پێرست

## ڕوداوەکانی ساڵی سی و شەشی کۆچی ( ٦٥٦-٦٥٧ زایینی )

## ڕەوانە کردنی فەرمانداران لەلایەن عەلی ناسازگاری معاویە

لەم ساڵەدا عەلی فەرمانداڕەکانی خۆی بۆ شارەکان ڕەوانە کرد: عوسمان کوڕی حەنیف بۆ بەسرە، عومارە کوڕی شەهاب بۆ کوفە، عوبەیدالله کوڕی عەباس بۆ یەمەن، قەیس کوڕی سەعد بۆ میسر و سەهل کوڕی حەنیف بۆ شام.

بەلاّم سەهل کوڕی حەنیف، ڕۆشت و کاتێك گەشتە تەبووك، ڕوبەڕوی چەندین سوار بویەوە و پرسیان: کێیت؟ وتی: فەرماندار. وتیان: لەکوێ؟ وتی: شام. وتیان: ئەگەر عوسمان تۆی ڕەوانە کردوە، بەخێربێیت و ئەگەر کەسێکی دیکە ڕەوانەی کردویت، بگەڕێرەوە. وتی: نەتانبیستوە چی ڕویداوە؟ وتیان: بیستومانە. سەهل گەڕایەوە بۆ لای عەلی. قەیس کوڕی سەعد، کاتێك گەیشتە ئەیلە، چەندین سوار ڕوبەڕوی بونەوە و پێیان وت: کێیت؟ وتی: لەهەلاّتوانی عوسمان، بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم تا پەنای بۆ ببەم و بەهاوکاری ئەو لەڕێگەی خوادا تێبکۆشم و سەرکەوم. وتیان: کێیت؟ وتی: سەعد کوڕی قەیس. وتیان: بەڕێکەوە. ئەو ڕۆشت و گەیشتە میسر و خەڵکەکەی بون بەچەندین دەستە: دەستەیەك هاوڕێیەتی هەموانیان کرد و لای ئەو کۆبونەوە، دەستەیەك لەخەرنەبا گۆشەگیر بون، دەستەیەك وتیان: ئەگەر بکوژەکانی عوسمان بکوژرێن، لەگەڵ ئێوە دەبین، دەستەیەك وتیان: تا ئەو کاتەی عەلی زیانی بەهاوەلاّنی ئێمە (بکوژەکانی عوسمان) نەگەیاندوە، لەگەڵ ئەو دەبین. قەیس ئەم بارودۆخەی بۆ عەلی نوسی.

عوسمان کوڕی حەنیف بەڕێکەوت و کەس ڕێگەی چونە ناو بەسردی لێنەگرت و بینی کوڕی عامر لەوێ هیچ بوچون و دەنگێکیی لەکاروباری شەڕدانیە. خەڵکی ئەو شارەیش بون بەچەندین دەستە: چاوەڕوان دەبین تا خەڵکی مەدینە چی دەکەن و ئێمەیش ئەو کارە دەکەین. بەلاّم عەمارە کوڕی شیهاب، کاتێك گەیشتە زوبالە، تەڵحە کوڕی خومیلد چاوی پێیکەوت. ئەو بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان هاتبو و بەردەوام دەیوت: هاوار لەکارێك کەپێش من نەکەوت بەلاّم من نەمدۆزیەوە! هاتنە

دەرمووەی ئەو لەکاتی گەڕانەوەی قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەهاوکاری کردنی عوسمان بو. کاتێك عومارە چاوی پێی کەوت، پێی وت: بگەڕێرەوە چونکە خەڵك جگە لەفەرماندارەکانی خۆیان کەسیان ناوێت. ئەگەر سەرپێچی بکەیت، دەتکوژم. عومارە گەڕایەوە و ئەم هەواڵەی بەعەلی گەیاند. عوبەیداللە کوڕی عەباس بەرەو یەمەن بەرێکەوت و لەوێ یەعلی کوڕی مونیە هەمو شتێکی لەباج وسەرانە... کۆکردەوە و لەگەڵ خۆی بۆ مەککەی برد و عوبەیداللە ڕۆشتە ناو یەمەن. کاتێك سوهەیل کوڕی حەنیف لەشام گەڕایەوە و هەواڵەکانی بەعەلی گەیشت، ئەو زوبەیر و تەڵحەی بانگ کرد و وتی: ئەوەی ئێوەم لێی ئاگادار کردوە، رویداوە. ئەوەی رویداوە، تەنیا بەلەناو بردنی دەستەمۆ دەکرێت. ئاژاوەیەکە هاوشێوەی ئاگر، کەهەرچەند زیاتر فووی لێبکەن، زیاتر بڵێسە دەسەنێت. ئەو دوانە پێیان وت: فەرمانێك بەئێمە بدە لەمەدینە برۆینەدەر یا زیاد دەبین و یا ئێمە ئازاد دەکەیت. عەلی وتی: سەرڕشتەی کاروبارەکان بەبەهێزی لەدەست دەگرم و تا ئەو شوێنەی پێویست بکات، خۆڕاگری دەکەم و ئەگەر رێگە چارەم نەما، دوایین دەرمان داغە.

نامەی بۆ ئەبوموسای ئەشعەری و معاویە نوسی. ئەبو موسا نامەی بۆ نوسی کەخەڵکی کوفە بەیعەتیان کردوە و فەرمانبەرەن. نامەی نوسی و نیشانیدا چ کەسانێك روداوەکانیان پێ خۆش نیە، چ کەسانێك رازین و چ کەسانێك نە، ئەوەندە بەرونی بۆی نوسی، وەك بڵێی عەلی خۆی لەو نزیکانە هەست پێدەکرد. نێردراوی عەلی بۆ لای ئەبوموسا لەکوفە، مەعبەدی ئەسلەمی بو و نێردراوەکەی بۆ لای معاویە لەشام، سەبرەی جۆهنی. ئەو ڕۆشتە لای معاویە بەڵام معاویە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. هەرجار کەداوای وەڵامێکی رون و ئاشکرای دەکرد، معاویە هیچی بەم هۆنراوەیە زیاد نەکرد:

| | |
|---|---|
| ادم ادامة حصن اوخذا بيدى | حر باضرو ساتشب الجزل و الضرما |
| فى جاركم و ابنكم اذ كان مقتله | شنعاء شيبت الاصداغ و اللمما |
| اعيا المسود بها و السيدون فلم | يوجد لنا غيرنا مولى و لا حكما |

یانی: وەك ئاسن لەسەر جێگەی خۆت بەهێزبە، بەدەستی من ئاگری شەڕێك

هەڵگیرسێنە کەوشك و تەڕ بسوتێنێت. ئەمە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی دراوسێکەتان و کوڕەکەتانە چونکە کوژرانی ئەو ئازارێکی گیانبڕ بو کەپرچ و موی بن گوێی سپی کرد. فەرمانبەران و فەرمانبرداران لەم کارەدا بێزار بون و بۆ ئێمە جگە لەخۆمان سەروەر و داوەرێك نەمایەوە.

کاتێك سێیەم مانگ لەکوژرانی عوسمان تێپەڕی، معاویە لەمانگی صەفەر /ئوتی ٦٥٦ زایینی پیاوێك لەبەنی عەبس بەناوی قەبیصەی بانگ کرد و تۆمارێکی مۆرکراوی پێدا کەناونیشانەکەی بەمشێوە بو: لەمعاویە بۆ عەلی. پێی وت: کاتێك گەشتیتە مەدینە، خوارەوەی تۆمارەکە لەدەست بگرە. پێی سپارد چی بکات و چی بڵێت. نێردراوی عەلی لەگەڵ ئەودا گەڕاندەوە. هەردوك هاتنەدەر و لە مانگی رەبیع الاول/ سێپتامبەری ٦٥٦ زایینی گەیشتنە مەدینە. عەبەسی، بەهەمان شێوە کەپێی راسپێردرابو، هاتە مەدینە و تۆمارەکەی بەرز کردەوە. خەڵك بەدوایدا بەرێکەوتن و زانیان معاویە ئاژاوەی بەدواوەیە. نێردراو هات و تۆمارەکەی تەسلیمی عەلی کرد. عەلی مۆرەکەی هەڵگرت بەلأم هیچ نامەیەکی تیا نەبینی. بەنێردراوی وت: چیت پێیە؟ نێردراو وتی: ئایا لەئەماندام؟ عەلی وتی: بەڵێ، نێردراو ناکوژن. نێردراو وتی: لەپشت سەری خۆم خەڵکانێکم بەجێهێشت تەنیا بەخوێن لەبەرابەری خوێن رازی دەبن! عەلی وتی: لەکێ؟ وتی: لەشادەماری گەردنی تۆ. من شەست هەزار پیاوی بەتەمەنم بەجێهێشت کە لەژێر کراسەکەی عوسمان بەردەوام دەگرین و ئەم کراسەیان لەبەرابەر ئەوان لەسەر تەختی وتاردانی مزگەوتی دەمەشق هەڵکردوە؟ عەلی وتی: ئایا خوێنی عوسمانیان لەمن دەوێت؟ ئایا من پرسەگێر نیم؟ مەگەر هاوشێوەی عوسمان خوێنم لەئەستۆی کەسانی دیکەدایە؟ ئەی خوایە! من بێ گوناحی خۆم لەخوێنی عوسمان بەتۆ دەسپێرم. سوێند بەخوا بکوژەکانی عوسمان هەلأتن و دیار نەمان و جگە لەخواستی خوا کەس ناتوانێت کارێك بکات و خوا هەر کارێکی بوێت، ئەنجامی دەدات. لای من برۆ. نێردراو وتی: لەئەماندام؟ عەلی وتی: لەئەماندایت. عەبەسی ڕۆشتەدەر و سەبەئیەکان هاواریان کرد: ئەم سەگە نێردراوی سەگەکانە. بیکوژن! پیاو هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی موزێر، ئەی بنەماڵەی قەیس، ئەسپ و ڕمەکانتان هەڵگرن. سوێند بەخوا ئەم بێ شەرمیەتان لەلایەن چوار هەزار پیاوی

خەساو وەلاّم دەدرێتەوە، بڕوانن نەخەساوەکان و سوارەکان چۆن بن! خەڵك هێرشیان کردە سەر بەلاّم موزێریەکان پارێزگاریان لێکرد. پێیان دەوت: بێدەنگ بە. دەیوت: سوێند بەخوا ئەمانە هیچ کات رزگاریان نابێت. ئەو مەترسیەی لەسەر ئەوان بو، گەیشت. ئەوەی لێی دەترسان، گیرۆدەی بون. سوێند بەخوا کاروبارەکانیان بەفیڕۆچو و غروریان دامرکایەوە و سوێند بەخوا رۆژیان نەگەیاندە شەو تا ریسوایی لەروخساریان دەرکەوت.

خەڵکانی مەدینە دەیانویست بۆچونی عەلی سەبارەت بەمعاویە بزانن و ئاگادار ببنەوە ئەو چۆن شەڕ کردن لەگەڵ خواوەندەکانی قیبلە( موسوڵمانان) بەرەوا دەزانێت. ئایا شەڕی لەگەڵ دەکات یا دەست لەکار دەکێشێتەوە؟ ئەوان هەواڵیان پێگەیشتبو کەکوڕەکەی حەسەن بۆ دەست کێشانەوە لەخەلافەت و دانیشتن لەماڵەوە هانی دەدات. زیاد کوڕی حەنزەلەیی تەمیمیان ناردە پێش چونکە ئەو بەردەوام لای عەلی ژیانی بەسەر دەبرد. ماوەیەك لای ئەو دانیشت، عەلی پێی فەرمو: زیاد ساز و بەرگ هەڵبگرە. پرسی: بۆ چ کارێك؟ فەرموی: بۆ شەڕ لەگەڵ خەڵکانی شام. زیاد وتی: چاوەڕوانی و درەنگ کردن شیاوترە. دواتر ئەم هۆنراوەی لەقەسیدەی زوهەیر کوڕی ئەبی سولەمی موزنی خوێندە.

و من لم يصانع فى امور كثيرة　　　يضرس بانياب و يوطا بمنسم

یانی: هەر کەس لەزۆربەی کارەکانی ژیانی خۆی بەسازگاری و ئاسان گرتن خوازیار نابێت، ئەو بەددانەکان دەجون و بەسمەکان دەیکوتن.

عەلی ئەم وتەی هێنایە سەرزمان وەك بڵێی روی دەمی لەو نیە:

متى تجمع القلب الزكى و صارما　　　و انفا حميا تجتنبك المظالم

یانی: هەر کاتێك دڵی پاك و شمشێری تیژ و سەرێکی سەرپێچیکەر لەبێداد کۆبکەیتەوە، رەنج و بێدادگەریەکان خۆیا لەتۆ بەدور دەگرن و دور دەکەونەوە.

زیاد هاتەدەر و بینی خەڵك چاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی ئەون. پێیان وت: چ هەواڵێکت پێیە؟ وتی: شمشێر ئەی خەڵکینە! زانیان عەلی دەیەوێت چی بکات.

زوبەیر و تەڵحە داوای فەرمانیان لێکرد تا بڕۆنە مەککە و عەمرەبەجێ بێنن. عەلی فەرمانی بەواندا. ئەو دوانە کۆچیان کرد و پەیوەستی مەککە بون. عەلی

کوڕەکەی محەممەد کوڕی حەنیفەی بانگ کرد و ئاڵای سوپاکەی خۆی بەو سپارد، عەبدالله کوڕی عەباسی کردە فەرماندەی باڵی ڕاست وعومەر کوڕی ئەبی سەلەم یا عەمرۆ کوڕی سوفیان کوڕی عەبدوالاسوەدی کردە فەرماندەی باڵی چەپ، ئەبو لەیلی کوڕی عومەر کوڕی جەراح برازای ئەبو عوبەیدەی جەراحی کردە فەرماندەی پێشەنگەکان و قوسەم کوڕی عەباسی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد. ئەوانەی هاوکاری عوسمانیان کردبو، هیچ کارێکی پێ نەسپاردن. بۆ قەیس کوڕی سەعید و عوسمان کوڕی حەنیف و ئەبوموسای ئەشعەری نامەی نوسی تا خەڵك بۆ شەڕی شامیەکان هان بدەن. خەڵکانی مەدینەی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان کۆکردەوە و فەرموی: فەرمانبردن لەخوا دەبێتە هۆی بەهێزی لەکاروبارەکانی ئێوە، لەو فەرمان ببەن و خۆتان بەدور مەگرن و بەناخۆشی مەزانن. سوێند بەخوا یا ئەم کارە دەکەن یا خوا سەروەری ئیسلام لەناو ئێوە دەباتەدەر و هەرگیز بۆ ئێوەی ناگەڕێنێتەوە و لەناو ئێوە هەڵیدەگرێت. بۆ شەڕی ئەم خەڵکە بڕۆنەدەر چونکە دەیانەوێت کاری ئێوە هەڵبوەشێننەوە، ئەگەری هەیە خوا بەهێزی ئێوە، ئەو خەڵکانەی لەهەر سوچ و قوژبنێکەوە گومڕابون، ڕێنوێنی بکات. ئێوەیش ئەوەی لەسەر شانی خۆتان بەپێویستی دەزانن، ئەنجامتان دابێت

## دەسپێکی شەڕی وشتر( جمل )

لەم کاتەدا کەئەوان سەرقاڵی خۆئامادە کردن بۆ شەڕی وشتر بون، هەواڵ هات کەزوبەیر، تەڵحە، عایشە، خەڵکانی مەککە و کەسانی هاوشێوەی ئەوان ڕێگەیان گۆڕیوە و بەرێگەی ناسازگاریدا دەڕۆن. عەلی خەڵکی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە و وتی: زوبەیر و تەڵحە و عایشە لەفەرمانڕەوایی ئەو تورە بون و خەڵك بۆ چاکسازی هان دەدەن. بەوانی وت: تا ئەو کاتەی ترسی بڵاوە لێکردن و لەناوچونی یەکگرتویی ئێوە لەئارادا نەبێت، چاوەڕوان دەکەم و ئەگەر ئەوان هێرش نەکەنە سەرمان، هێرش ناکەینە سەریان وبەوەی بەمن دەگات، بەسەندە دەکەم.

دواتر هەواڵی پێگەیشت ئەوان ئاهەنگی بەسرەیان کردوە. لەم کارە شادمان بو و وتی: کوفە شوێنی مانەوەی پیاوانی عەرەب و بنەماڵە گەورەکانی ئەوانە. عەبدالله

کوڕی عەباس پێی وت: ئەوەی لەمبارەوە تۆ شادمان دەکات، من ناڕاحەت دەکات. کوفە سەراپەردەی گەورەکانی عەرەبە و بەهێزی خەڵکەکەی، پاشەکشێ بەم کەسانە دەکات، هێشتا کەسانێك لەم شارەدا هەن چاوی تەماحیان بڕیوەتە ئەم کارە و دەستیان پێی ناگات. کاتێك بەمشێوە بێت، ئەم جۆرەکەسانە دژی هەر کەسێك ناهەنگی مەبەستەکەی ئەوان بکات، شۆڕش دەکەن تا جموجۆڵەکەی دامرکێننەوە.

عەلی وتی: بارودۆخ هاوشێوەی ئەوەیە تۆ دەیڵێیت. بۆ ڕۆشتن بۆ شەڕی ئەوان ئامادە بو و خەڵکانی مەدینەی بۆ شەڕ هاندا بەڵام ئەوان دودڵیان لەخۆیان نیشاندا. کومەیلی نەخەعی بۆ لای عەبداللە  کوڕی عومەر ڕەوانە کرد تا بیهێنێتە لای و عەلی داوای لێ کرد لەگەڵ ئەودا بۆ شەڕ کردن خۆی ئامادە بکات. عەبداللە وتی: من یەکێك لەخەڵکانی مەدینەم. ئەگەر ئەوان بەم کارە ڕازی بون، ڕازی دەبم و هەر کاتێك بۆ شەڕ بەرێکەوتن لەگەڵ ئەوان دەبم و ئەگەر خۆیان بەدور گرت، خۆم بەدور دەگرم. عەلی وتی: کەسێك وەك دەستەبەری خۆت بۆ هەڵس و کەوتت بناسێنە. عەبداللە وتی: نایکەم. عەلی وتی: ئەگەر بەو شێوە نەدەبو کەدەمزانی لەمناڵیەوە تا گەورەیی لار بویت، بەشێوەیەکی دیکە منت دەبینی. ئازادی بکەن و خۆم دەستەبەری ئەوم. کوڕی عومەر بۆ مەدینە گەڕایەوە و خەڵك بەردەوام دەیانوت: سوێند بەخوا نازانین چی بکەین. ئەم کارە بەبڕوای ئێمە پەرێشان بوە. چاوەڕوان دەکەین تا ڕۆشن ببێتەوە.

عەبداللە کوڕی عومەر هەمان شەو لەمەدینە ڕۆشتەدەر وپێش ڕۆشتن دایکی کولسوم کچی عەلی و هاوسەری عومەر کوڕی خەتابی لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار کردەوە و پێی وت چی لەخەڵك بیستوە و ئێستا بۆ عەمرە دەڕواتەدەر و فەرمانبردنی عەلی جگە لەشەڕ کردن دژی موسوڵمانان لەئەستۆیدایە. عەلی شەوی کردە بەیانی و پێی وترا: دوێ شەو کارێکی گەورەتر و ناخۆشتر لەنافەرمانی زوبەیر و تەڵحە و عایشە و معاویە رویداوە. وتی: چ کارێکە؟ وتیان: کوڕی عومەر بەرەو شام کەوتە ڕێ چونکە هاتە بازار و چوارپێ و پیاوە چالاکەکانی ئامادە دەکرد وبۆ هەر ڕێگەیەك بەدوای ڕێنیشاندەرێك دەگەڕا. خەڵکانی مەدینە بەتەواوی شڵەژان. دایکی کولسوم کچی عەلی ئەم هەواڵانەی بیست و ڕۆشتە لای باوکی و لەهەواڵە ڕاستە ئاگاداری

کردەوە. عەلی ئارام بویەوە و بەخەڵکی وت: برۆنە ماڵەکانی خۆتان چونکە نە کچەکەم درۆ دەکات نەعەبداللە کوڕی عومەر درۆی لەگەڵ کردوە. سوێند بەخوا عەبداللە لەنزیك من و هاوڕێی منە. خەڵك گەڕانەوە.

هۆکاری کۆبونەوەی ئەوان لەمەککە ئەوە بو عایشە لەکاتی گەمارۆ خستنە سەر عوسمان، بەرەو مەککە ڕۆشتبو. دواتر لەمەککە هاتەدەر و ئاهەنگی مەدینەی کرد. کاتێك گەیشتە (سێرف) پیاوێك لەخاڵەکانی لەبەنی لەیس بەناوی عوبەید کوڕی ئەبی سەلە ( کوڕی دایکی کەلاب) چاوی پێی کەوت. عایشە پرسی: کار گەیشتە کوێ؟ پیاو وتی: عوسمان کوژرا و خەڵك هەشت ڕۆژ چاوەڕێیان کرد. عایشە پرسی: دوای ئەوە چیان کرد؟ وتی: خەڵك بۆ بەیعەت لەگەڵ عەلی کۆبونەوە. عایشە وتی: خۆزگە ئاسمان لەزەوی بدات ئەگەر کاروبارەکان بۆ ئەم پیاوە ئارام بگرێت! من بگەڕێننەوە، بمگەڕێننەوە! بۆ مەککە گەڕایەوە و بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا عوسمانیان بەستەم کاری کوشت. سوێند بەخوا داوای خوێنی ئەو دەکەم. پیاو بەعایشەی وت: بۆ ئەم قسە دەکەیت خۆت یەکەم کەس بویت هەڵس و کەوتی دژت لەگەڵ ئەو گرتەبەر، تۆ خۆت بویت بەردەوام دەتوت: ئەو پیرە خڵەفاوە کەمتیارە بکوژن چونکە لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە. عایشە وتی: سەرەتا داوایان لێکرد بۆ ڕێگەی خوا بگەڕێتەوە و دواتر خوێنیان ڕژاند. ئەم وتانەی ئێستا دەیهێنمە سەرزمان، لەوتەکانی یەکەمم باشترە. کوڕی دایکی کەلاب روی کردە عایشە و وتی:

| | |
|---|---|
| فمنك البداد و منك الغير | ومنك الرياح ومنك المطر |
| و انت امرت بقتل الامام | و قلت لنا انه قد كفر |
| فهبنا اطعانك فى قتله | و قاتله عندنا من امر |
| و لم يسقط السقف من فوقنا | و لم ينكس شمسنا و القمر |
| و قد بايع الناس ذاتدرا | يزيل الشبا و يقيم الصعر |
| و يلبس للحرب اثوابها | و ما من وفى مثل من قد غدر |

یانی: لەتۆ بو پەشیمانی دەستی پێکرد و لەتۆ بو ناسازگاری دروست بو. لەتۆوە بو با دەستی بەهەڵکردن کرد و باران دەستی بەبارین کرد. تۆ فەرمانت دا تا ڕێبەرەکەی ئێمە بکوژن و تۆ بویت وتت ((ئەو لەدین هەڵگەڕاوەتەوە)) ئێستا ئاگادار بە

لەکوشتنی ئەو، ئێمە فەرمانی تۆمان ئەنجامداوە. بکوژەکەی ئەو بەبڕوای ئێمە کەسێکە کەفەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکردوە. نە ئاسمان لەسەرەوە کەوتە سەر زەوی و نە مانگ و خۆر گیران. خەڵك لەگەڵ پیاوێکی بەهێز و فرمزان پەیمانی فەرمانبرداریان بەست کەخراپیەکان دەسڕێتەوە و لاریەکان راست دەکاتەوە و بۆ شەڕ جل وبەرگی پێویست لەبەر دەکات. ئەوەی رێز لەپەیمانەکەی خۆی بگرێت، وەك ئەو کەسە نیە بیشکێنێت و پێشێلی بکات.

ئەو بۆ مەککە گەڕایەوە و ئاهەنگی حجری کرد و خۆی لەوێ شاردەوە. خەڵك دەوریان گرت و عایشە هاواری کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، شۆڕشگێرانی شارە دورەکان و ئاودێرەکان و کۆیلەکانی مەدینە دوێنێ دەوری ئەم پیاوە بەستەم کوژراوەیان گرت و سەرکۆنەیان کرد کەگەنجە کەم تەمەنەکانی وەك فەرماندار دەست نیشان کردوە. پێش ئەویش ئەو کەسانە بەفەرمانداری گەشتبون. خوازیاری ئەو شوێنانە بون کەکردبویە پێگە و پاسگای خۆی. ئەو دەستی لێ هەڵگرت و بەوانی بەخشی. کاتێك دژی ئەو بەڵگە وبیانویان دەست نەکەوت، دەستیان بەشەڕ کردن لەگەڵ ئەو کرد و خوێنی پارێزراویان رژاند و شاری رێز لێگیراویان کردە شوێنی خراپەکاری خۆیان، مانگە رێز لێگیراوەکانیان خستە ژێرپێ و سامانەکانیان تالآن کرد. سوێند بەخوا پەنجەیەکی عوسمان لەهەموی ئەوان (بەشێوەیەك هەمو زەویان پڕ کردبێت) باشترە! سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی سەرکۆنەی عوسمانیان پێدەکرد، گوناح بو، ئەو لێی پاك بویەوە بەهەمان شێوە کەزێر لەخاك و جل و بەرگ لەچڵك پاك دەبێتەوە چونکە ئەویان لەخوێنە پاکەکەیدا سور کرد و جەستەیان بەخوێنەکەی شۆرد.

عەبدالله کوڕی عامر حەزرەمی فەرمانداری مەککە لەلایەن عوسمانەوە وتی: من یەکەم کەسم داوای خوێنی عوسمان دەکەم! ئەو یەکەم کەس بو وەڵامی بانگەوازەکەی عایشەی دایەوە. ئومەوییەکان کەدوای کوژرانی عوسمان بۆ مەککە هەڵاتبون شوێنی کەوتن وسەریان بەرز کردوە. یەکەم جار لەحجاز دەستیان بەقسە کرد و سەعید کوڕی عاص و وەلید کوڕی عەقەبە و کەسانیتر لەئومەوییەکان شوێنیان کەوتن. عەبدالله کوڕی عامر لەبەسرە بەسامانێکی زۆرەوە پەیوەستی ئەوان بو و یەعلی کوڕی مونیە لەیەمەنەوە هات و شەسەد هەزار درەمی بۆ هێنان. ئەو لە (ئەتەح) خێوەتی

هەڵدا. زوبەیر و تەڵحە لەمەدینەوە هاتن و چاویان بەعایشە کەوت. ژن پرسی: چی لەپشتی سەرتانە؟ وتیان: دەستەیەك ئاژاوەچی لەبیابان نشینەکان وشلەژاوەکانی مەدینەمان بینی و چاومان بەخەڵکانێکی سەرگەردان کەوت کە نەراستی و دروستی دەناسن ونە سەرکۆنەی خراپە دەکەن و نە ڕێزیان لەخۆیان دەگرت. ژن وتی: بڕۆنە لای ئەم ئاژاوەچیانە. وتیان: دەڕۆینە شام. کوڕی عامر وتی: معاویە شام بۆ ئێوە دەپارێزێت، بەرەو بەسرە بەرێکەون چونکە دەست پەروەردەکانی من و سامانەکانی من لەوێیە و خەڵکەکەی خوازیاری تەڵحەن. وتیان: خوا تۆ ناشیرین بکات! تۆ نەئاشتی خوازیت نە شەڕکەر. بۆ نەمایتەوە تا ببیتە پشتیوانی ئێمە و دواتر بڕۆینە کوفە و ئاسایشی ئەم خەڵکە تێك بدەین؟ وەڵامێکی شیاوی نەبو بیداتەوە. لەبەر ئەمە لەسەر بەسرە ڕێککەوتن. بەعایشەیان وت: با واز لەمەدینە بێنین چونکە لەم شارەدا هاورێیانێکمان هەیە توانایی خۆڕاگری لەبەرابەر فەرمانڕەوایی ئاژاوەچیەکانیان نیە. دەڕۆینە شارێکی لەدەست چو کەخەڵکەکەی لەبەرابەر ئێمە لەپێبەند بون بەپەیمانەکەی عەلی قسە دەکەن و تۆ ئەوان وەك خەڵکانی مەککە هان دەدەیت. ئەگەر خوا کارەکانمان بۆ ڕێکبخات، ئەوە دەبێت کەدڵمان دەیخوازێت و گەرنە هەوڵی خۆمان داوە تا خوا ئەوەی مەبەستیەتی، بەکۆتایی دەگەیێنێت.

عایشە رازی بو. داوایان لەعەبدالله کوڕی عومەر کرد هاورێیەتیان بکات بەڵام رازی نەبو و وتی: من لەخەڵکانی مەدینەم. کارێك دەکەم ئەوان بیکەن. ئەویان بەجێهێشت.

ژنانی پێغەمبەر لەگەڵ ئەو ئاهەنگی مەدینەیان بو بەڵام کاتێك بۆچونی گۆڕا و روی لەبەسرە کرد، کشانەوە. حەفصە ویستی لەگەڵی بەرێکەوێت بەڵام براکەی عەبدالله کوڕی عومەر ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت. یەعلی کوڕی ئومەییە شەشسەد وشتر و شەشسەد هەزار درەمی بەوان دا و عەبدالله کوڕی عامر سامانێکی فراوانی خستە بەردەستی ئەوان. جارچی عایشە جاریدا: دایکی باوەڕداران و زوبەیر و تەڵحە ئاهەنگی بەسرەیان هەیە، هەر کەس دەیەوێت هێز بەئیسلام ببەخشێت و لەگەڵ خوێنخۆرەکان شەڕ بکات وتۆڵەی عوسمان بکاتەوە و چوارپێ و ساز و بەرگی نیە، بابێت. شەشسەد کەسیان سوار شەشسەد وشترەکە کرد و بەسوپایەك لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر بەرێکەوتن. دەستەیەك دەڵێن: نۆسەد کەس بون. ئەوان لەخەڵکانی

مەدینە و مەککە بون. خەڵك پەیوەستیان بون و ژمارەیان گەشتە سێ هەزار پیاوی شەڕکەر. دایکی فەزڵ دایکی عەبداللە کوڕی عەباس کرێی بەپیاوێك لەجوهەینە بەناوی زەفەر بەخشی و فەرمانی پێدا بڕواتە لای عەلی و لەکارەکان ئاگاداری بکاتەوە. زەفەر هات و نامەکەی تەسلیمی عەلی کرد.

عایشە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەمەککەوە بەرێکەوت. کاتێك لەشار ڕۆشتنەدەر، مەروان کوڕی حەکەم بانگی دا و دواتر هات و لەسەر سەری تەڵحە و زوبەیر وەستا و وتی: بەکام یەك لەئێوە وەك سەروەری باوەڕداران سڵاو بنێرم؟ کام یەك لەئێوە پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکەن؟ عەبداللە کوڕی زوبەیر وتی: لەباوکی عەبداللە یانی زوبەیر، محەممەد کوڕی تەڵحە وتی: لەباوکی محەممەد یانی تەڵحە. عایشە کەسی بۆ لای مەروان نارد و وتی: ئایا دەتەوێت جیایی لەنێوان ئێمەدا دروست بکەیت؟ دەبێت خوشکەزاکەم عەبداللە کوڕی زوبەیر پێشنوێژی خەڵك بێت. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو عەتاب کوڕی ئەسید پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد تاکوژرا. مەعاز کوڕی عوبەید بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر سەردەکەوتین دەستمان بەکوشتاری یەکتر دەکرد چونکە نەزوبەیر کاری فەرمانڕەوایی بەتەڵحە دەسپارد نە تەڵحە بەزوبەیر.

دایکانی باوەڕداران (هاوسەرانی پێغەمبەر) تا زات عەرەق عایشەیان ڕەوانە کرد و لەوێ دەستیان بەشین بۆ ئیسلام کرد. نەبینراوە پێش ئەو ڕۆژە پیاوان و ژنانی گریان لەیەك شوێن کۆببنەوە. لەبەر ئەمە ئەو ڕۆژەیان بەڕۆژی (شی) ناوبرد. کاتێك گەشتنە زات عەرەق، سەعید کوڕی عاص ڕوبەڕوی مەروان کوڕی حەکەم و هاوڕێکانی بویەوە. وتی: بۆ کوێ دەڕۆن. خوێنی خۆتان لەسەر پشتی وشترەکان بەدوای خۆتانا بۆ کوێ دەبەن؟ (عایشە و تەڵحە و زوبەیر خوێنی عوسمانن). ئەوان بکوژن و بۆماڵەکانی خۆتان بگەڕێنەوە. وتیان: دەڕۆین تا هەمو بکوژەکانی عوسمان بکوژین. سەعید لەگەڵ زوبەیر و تەڵحە بەتەنیا دانیشت و وتی: ڕاستی بەمن بڵێن ئەگەر سەرکەوتن فەرمانڕەوایی بەکێ دەسپێرن؟ وتیان: بەهەرکام لەئێمە دوانە کەخەڵك هەڵیبژێرن. وتی: دەبێت تەسلیمی کوڕەکانی عوسمانی بکەن چونکە ئێوە بۆ تۆڵەی خوێنی ئەو هاتونەتەدەر. وتیان: واز لەموهاجیرە پیرەکان بێنین وفەرمانڕەوایی تەسلیمی بێ

باوكان بكەین! سەعید وتی: من بكوژی ئەوكەسەم بیەوێت خەلافەت لەدەست منالەكانی عەبد مەناف دەربێنێت. ئەو گەڕایەوە و عەبدالله كوڕی خالد كوڕی ئەسید لەگەڵ ئەو گەڕایەوە. موغەیرە كوڕی شەعبە وتی: بۆچونی راست ئەوەیە كەسەعید وتی، هەر كەس لەخەڵكی سەقیف لێرەیە دەبێت بگەڕێتەوە. ئەوان گەڕانەوە و لەگەڵ وەلید وئەبان كوڕەكانی عوسمان بەرێكەوتن.

یەعلی كوڕی ئومەییە وشترێكی بەعایشەدا كەبەهەشتا هەزار درەم كڕیبوی. عایشە سواری بو. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵكو پیاوێك لەعوڕەینە وشترەكەی بەو بەخشی.

پیاوی عوڕەنی دەڵێت: ڕۆژێك كەسوار لەسەر وشتر رێگەم دەبڕی، كاروانێك لەبەرابەر من دەركەوت و سوارەیەك لەناو ئەواندا وتی: وشترەكەت دەفرۆشی؟ وتم: بەڵێ. وتی: بەچەند؟ وتم: بەهەزار درەم. وتی: ئایا شێتیت؟ وتم: بۆ شێت بم. وتی: ئەگەر بزانیت بۆ كێمان دەوێت! بۆ دایكی باوەڕداران عایشە! وتم: بەخۆڕایی وەریبگرە. وتی: بەمشێوەیە نا بەڵكو لەگەڵ ئێمە بۆلای كاروان وەرە تا وشتر و زێرت پێببەخشین. دەڵێت: ئەوان وشترێكی (مەهری) ( پەیوەست بەمەهرە كوڕی حەیدان ژنێك لەعەرەبەكان كەوشترەكانی بێ ئەندازە تیژپێ بون) لەگەڵ شەشسەد یا چوارسەد درەم بەمن بەخشی و وتیان: ئەی برای عوڕەینەیی، ئایا رێگا دەناسیت؟ وتی: شارەزاترینی خەڵكانم. وتیان: لەگەڵ ئێمەدا وەرە. من لەگەڵ ئەوان بەرێكەوتم و لەهیچ دۆڵ و شوێنێك تێنەپەڕیتم مەگەر ئەوەی ناوی ئەو شوێنەیان لێ پرسیم. سەرئەنجام گەیشتینە (حەواب) و سەگەكانی ئەو ناوچەیە لەبەرابەر ئێمە دەستیان بەوەڕین كرد. وتیان: ئەم ئاوە ناوی چیە؟ وتم: ناوی حەواب. عایشە بەبەرزترین دەنگی خۆی هاواری كرد: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). من هەمان ژنم. رۆژێك كەهاوسەرانی پێغەمبەر لای ئەو بون، بیستم كەوتی: خۆزگە دەمزانی كامتان گیرۆدەی وەڕینی سەگەكانی حەواب دەبن. دواتر ملی وشترەكەی خۆی گرت و خەواندی و وتی: بمگەڕێننەوە. سوێند بەخوا من خواوەندی ئاوی حەوابم. عەبدالله كوڕی زوبەیر بەعایشەی وت: درۆ دەكات. ئەوان شەو رۆژێك لەسەر ئاوەكە مانەوە. كوڕی زوبەیر بەردەوام پێداگری دەكرد وئەو ژنە هەوڵی دەدا

بگەڕێتەوە. سەرئەنجام پێی وت: رابكەن، رابكەن كەعەلی كوڕی ئەبی تالب گەیشت! دواتر بەرەو بەسرە بەڕێكەوتن. كاتێك گەشتنە دەوروبەری بەسرە، عومەیر كوڕی عەبدالله تەمیمی روبەرویان بویەوە و وتی: ئەی دایكی باوەڕداران، بەخوا سوێندت دەدەم ئەمڕۆ بڕۆیتە لای خەڵكانێك كەپەیك و پەیامت بۆ لای ئەوان نەناردوە. كوڕی عامر (عەبدالله) بەخێرایی رەوانە بكە چونكە ئەو لەبەسرە دەست پەروەردەی هەیە. دەبێت ئەو بڕواتە لای ئەوان وئەوان چاویان بەخەڵك بكەوێت تا تۆ بگەیت و بزانن بۆ چ كارێك هاتویت. عایشە ئەوی رەوانە كرد وئەو بەنهێنی ڕۆشتە ناو بەسرە و ڕۆشتە لای ئەو كەسانە. عایشە لەگەڵ پیاوانێك لەخەڵكانی بەسرە و لەگەڵ ئەحنەف كوڕی قەیس و سەبرە كوڕی شەیمان و هاوشێوەكانی ئەوان دەستی بەنامەنوسین كرد و لەحەفیر مایەوە وچاوەڕوانی وەڵامەكانی دەكرد.

كاتێك ئەم هەواڵە بەخەڵكی بەسرە گەیشت، عوسمان كوڕی حەنیف كەسێكی بەدوای عێمران كوڕی حوصەین رەوانە كرد كەباوەڕپێكراوی كۆمەڵانی خەڵك بو و ئەوی لەگەڵ ئەبو ئەلسوەدی دۆئەلی رەوانە كرد كەرێبەرایەتی فرمزانەكانی لەدەستا بو. بەم دوانەی وت: بڕۆنە لای ئەم ژنە و لەكاری ئەو و هاورێكانی ئاگادار ببنەوە. ئەم دوانە هاتنەدەر و لەحەفیر گەیشتنە لای عایشە. ژن فەرمانیدا و ڕۆشتنە لای. ئەم دوانە ڕۆشتنە ناو و سلاویان كرد و وتیان: فەرماندارەكەمان ئێمەی رەوانە كردوە تالەمەبەستەكەی تۆ ئاگادار ببینەوە، ئایا ئێمە ئاگادار دەكەیتەوە؟ عایشە وتی: وەك من كەسێك منالەكانی خۆی ئاگادار ناكاتەوە. بزانن ئاژاوەچیەكان ودورخراوەكانی هۆزەكان هێرشیان كردە سەر بارەگایی پێغەمبەر و كارە نەشیاوەكانیان لەوێ ئەنجامدا و تازە گەیشتوانیان لەوێ پەنادا و شیاوی نفرین خواوەند و پێغەمبەرەكەی ئەون و جیاواز لەوە، رێبەری موسوڵمانانیان كوشت بێ ئەوەی دەستی بەخوێنی كەسێك پیس بوبێت و بێ ئەوەی هۆكارێكیان هەبێت و سامان و شار و مانگە رێزلێگیراوەكانیان پێشێل كرد. من لەناو موسوڵمانان هاتمەدەر تا ئاگاداریان بكەمەوە ئەوان چیان كردوە و ئەو خەڵكەی لەپشت سەری ئێمەون چۆن رۆژگار بەسەر دەبەن و چیان دەوێت و چی بكەن تا ئەم كارە چاك بكەنەوە. ((زۆربەی وتارە چپەچپەكانی ئەوان سودێكی نیە جگە لەوەی فەرمان بەهەزینە كردنی سامانەكان لەرێگەی خوادا بدات یا داوای

چاکەکاری لەکەسانی دیکە بکات و خەڵکان بەچاکسازی ناچار بکات وهەرکەس ئەم کارانە بۆ رەزامەندی خوا بکات، پاداشێکی گەورەی پێ بدەین (نسا /١١٤/٤). ئەمەیە ئەو کارەچاکەی خەڵکی بۆ هان دەدەین وئەو کارە خراپەی خەڵکی لێ دور دەخەینەوە.

عیمران و ئەبونەلسوەد لای ئەو ڕۆشتنەدەر و ڕۆشتنە لای تەڵحە و پرسیان: چ هۆکارێك تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟ وتی: تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان. وتیان: مەگەر بەیعەتت لەگەڵ عەلی نەکرد؟ وتی: بەیعەتم کرد بەڵام شمشێر لەسەر ملم بو. ئەگەر عەلی بکوژەکانی عوسمانی بەئێمە سپارد، ئەو لەسەر کارەکەی لانابەین (ئەگەر بەئێمەی دەسپارد ئەومان لەسەر کار لانەدەبرد) دواتر ڕۆشتنە لای زوبەیر و هەمان قسەیان دوبارە کردەوە کە بەتەڵحەیان وت و ئەومیان بیست کەتەڵحە وتی. ئەو دوانە بۆ لای عوسمان کوڕی حەنیف گەڕانەوە. جارچی عایشە جاڕیدا تا خەڵك بەرێکەون.

ئەو دوانە ڕۆشتنە لای عوسمان و ئەبو ئەنەلسوەد پێش عوسمان دەستی بەقسە کردن کرد و وتی:

یا ابن حنیف قد اتیت فانفر　　　　و طاعن القوم و جالدو اصبر

و ابرز لهم مستلئما و شمر

یانی: ئەی کوڕی حەنیف، هێرشیان کردە سەرتۆ و ئاگادار بە. لەگەڵ ئەم خەڵکە بەرم و شمشێر هەڵس و کەوت بکە و چالاك بە و خۆڕاگری بکە. لەبەرابەر ئەوان زرێ بپۆشە و خودە لەسەر و داوێن لەکەمەر دەرکەوە.

عوسمان وتی: هەموان لەلاین خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/١٥٦/٢) سوێند بەخواوەندی کەعبە ئاشی ئیسلام کەوتۆتە کار، بزانن لەسەر خوێنی چ کەسێك دەسوڕێت. عیمران وتی: بەڵێ بەخوا شەڕێکی درێژ یەخەی ئێوە دەگرێت. عوسمان وتی: ئەی عێمران، بۆچون و باوەڕی راست بەمن بڵێ. عیمران وتی: خۆت بکێشەرەوە چونکە من دادەنیشم. عوسمان وتی: ئەوان راودەنێم تا عەلی کوڕی ئەبی تالب بێت. عیمران بۆ ماڵ گەڕایەوە و عوسمان سەرقاڵی کارەکەی خۆی بو. هشام کوڕی عامر هاتە لای ئەو وتی: ئەم کارەی تۆ شوێنی کەوتویت، چارەنوسێکی خراپتر لەوەی گومان دەکەیت، بەدوای خۆیدا دێنێت. ئەمە کەلێنێکە یەك ناگرێتەوە و

شکاوێکە چاك نابێتەوە. لەگەڵ ئەوان میهرەبانی بکە تا فەرمانی عەلی بگات. عوسمان ڕازی نەبو و لەناو خەڵکەکەی خۆی جاریدا و فەرمانیدا جل و بەرگی شەڕ لەبەر بکەن. خەڵك لەمزگەوت کۆبونەوە. ئەو فەرمانیدا کەل وپەلی شەڕ هەڵبگرن و خۆیان بۆشەڕ ئامادە بکەن. پیاوێکی هەستاند تا بەفریو خۆی بەقەیسی و کوفی نیشان بدات. پیاو هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، من قەیس کوڕی عەقدیە حەمسیم. ئەگەر ئەم کەسانە لەترسا بۆ ئێرە هاتون، پشتیان کردۆتە شارێك کەمەل تیایدا ئارام و ئاسودەیە و ئەگەر بۆ سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی عوسمان هاتون، ئێمە بکوژەکانی ئەو نین. فەرمان لەمن ببەن وئەوان بۆ ئەو شوێنەی هاتون بگەڕێننەوە. ئەسوەد کوڕی سەریعی سەعدی وتی: ئایا گومان دەکەن ئێمە بکوژەکانی عوسمانین؟ ئەوان هاتون تا لەئێمە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان هاوکاری وەربگرن و هەروەها لەکەسانی دیکەیش. خەڵك بەردبارانیان کرد و عوسمان زانی ئەوان لەبەسرە هاوەڵانیان هەیە. ئەو دڵشکاو بو.

عایشە لەگەڵ هاوەڵەکانی هات تا گەیشتە مەربەد. ئەوان لەسەرەوە هاتن و وەستان تا عوسمان و هاوەڵانیان گەیشتن. لەخەڵکی بەسرە ئەو کەسانەی دەیانویست هاوڕێیەتی ئەو ژنە بکەن، ڕۆشتنە لای ئەو. تەڵحە دەستی بەقسە کردن کرد. ئەو لای ڕاستی مەربەد بو و عوسمان لەلای چەپ. خەڵك بێدەنگ بون وگوێیان لەو ڕاگرت. تەڵحە سوپاسی خوای کرد و وەسفی کرد و ئاماژەی بەعوسماندا و لەپێشیەکانی ئەوی بیرخستەوە کەخوێنی ئەو بەناڕەوا ڕژاوە. زوبەیریش ئەم قسانەی کرد. ئەوانەی لای ڕاستی مەربەد بون، وتیان: ئەم دوانە درۆیان کرد و هەڵیت و پڵیتان وت و پەیمانیان شکاند و گوناحیان کرد چونکە لەگەڵ عەلی بەیعەتیان کرد و دواتر هاتن و دەستیان بەم قسە قۆڕانە کرد. خەڵك یەکتریان خۆڵباران و بەردباران کرد و یەکتریان ترساند. دواتر عایشە دەستی بەقسە کردن کرد. ئەو دەنگێکی بەرزی هەبو. سوپاسی خوای کرد و وتی: خەڵك ڕەخنەیان لەعوسمان دەگرت و درۆیان بۆ فەرماندارەکانی هەڵدەبەست. ئێمە سەیری ئەم کاروبارانەمان کرد و زانیمان عوسمان پاك و بێ گوناحە و ئەوانمان بەخراپەکاران و پەیمان شکێنەکان و درۆزنەکان بینی. ئەوان شتێکیان وت و سەرقاڵی کارێکی دیکە بون. کاتێك بەهێز بون زیاتر بێ شەرمیان بەرابەر بەو نواند و ڕژانە

ماڵەکەی و خوێن و مانگی حەرام و سامان و شاری ڕێزداریان بێ بەڵگە و بیانو تاڵان کرد. ئەو کارەی لەسەر ئێوە پێویستە، گرتنی بکوژەکانی عوسمان و سەقامگیر کردنی نوسراوی خواوەندە کەدەڵێت: ئەتبینی دەستەیەك لەکەسەکان بەهرەیەکیان لەنوسراوی خوا پێبڕا و بۆ باوەڕ هێنان بەو نوسراوەیە بانگ کران تا لەناو ئەواندا داوەر بێت و دواتر دەستەیەك لەوان پشتی تێدەکەن و خۆیانی لێ دور دەخەنەوە (ال عمران/٣/٢٣)

هاوەڵانی عوسمان کوڕی حەنیف بون بەدودەستە: دەستەیەك وتیان: ژن راستی کرد و قسەی جوانی کرد. دەستەیەکی دیکە وتیان: سوێند بەخوا درۆتان کرد و ئێمە نازانین بۆچ مەبەستێك هاتون! هەردولا بەردباران و خۆڵبارانی یەکیان کرد. کاتێك عایشە ئەمەی بینی، بۆ دواوە گەڕایەوە وئەوانەی لەلای راست بون، بەرێکەوتن و لەعوسمان کوڕی حەنیف دورکەوتنەوە و لەمەربەد لەشوێنی پێستەخۆشکەرەکان وەستان. هاوەڵانی عوسمان لەشوێنەکانی خۆیان مانەوە. دەستەیەك پەیوەستی عایشەبون و دەستەیەك لای عوسمان مانەوە.

جاریە کوڕی قودامەی سەعدی هات و وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، سوێند بەخوا کوژرانی عوسمان کارێکی ئاسانتر لەهاتنی تۆ لەسەر ئەم وشترە لەبەرابەر ئەم پیاوە ئاسن پۆشانەیە! تۆ لەلایەن خوا رێز و پەردەیەکت هەبو کەرێزی خۆتت شکاند وپەردەی خۆتت دڕاند! ئەو کەسەی شەڕ لەگەڵ تۆ بەرەوا بزانێت، کوشتنی تۆ بەراست دەزانێت! ئەگەر بەدڵخواز بۆ ئێرە هاتویت، بۆ ماڵەکەت بگەڕێرەوە و ئەگەر تۆیان بەزۆر هێناوە، داوای هاوکاری لەخەڵکەکەت بکە تا تۆ بۆ ماڵ بگەڕێننەوە.

پیاوێك لەبەنی سەعد هاتە لای زوبەیر و تەڵحە و وتی: تۆ ئەی زوبەیر، هاوەڵێکی نزیکی پێغەمبەر بویت و تۆ تەڵحە خۆت کردە قەڵغانی پێغەمبەر. من دایکتان لەگەڵ ئێوە دەبینم. ئایا ژنەکانی خۆتان هێناوە؟ من کارم بەئێوە نیە.؟ لەوان دورکەوتەوە و وتی:

| | |
|---|---|
| صنتم حلائلكم و قدتم امكم | هذا لعمرك قلة الانصاف |
| امرت بجر ذيولها فى بيتها | فهوت تشق البيد بالايجاب |
| غرضا يقاتل دونها اناؤها | بالنبل و الخطى و الااف |

هتكت بطلحة و الزبير ستورها          هذا المخبر عنهم و الكافی

یانی: ژنانی خۆتان پاراست و دایكتان پێش خۆتاندا، سوێند بەخوا ئەمە لەدادپەروەرییەوە دورە. خوا فەرمانی بەو دا لەماڵەكەی بمێنێتەوە و داوێن لەزەوی بسوێت بەڵام ئەو بۆ هێرش كردن لەبیابان هاتەدەر. بوبەنیشانە و منداڵەكانی بەتیر و تیغی خەتی (دروستكراوی شاری خەت) و بەشمشێرەكان لەبەردەمی ئەو بۆ شەڕ راوەستان. زوبەیر و تەڵحە پەردەی ئەویان دڕاند. هەواڵی كارەكەی ئەوان ئەمەیە و بەس.

حوكەیم كوڕی جەبەلەی عەبدی فەرماندەی سوارەكان، بۆ پێشەوە غاریدا و شەڕی دەستپێكرد. هاوەڵانی عایشە ڕمەكانی خۆیان بڵند كرد بەڵام دەستیان لەشەڕ هەڵگرت تا حوكەیم و هاوەڵانی دەستیان لەشەڕ هەڵگرت. حوكەیم نەوەستا و درێژەی بەشەڕ لەگەڵ ئەواندا. هاوەڵانی عایشە بەهەمان شێوە وەستابون و زیانیان لەخۆیان دور دەخستەوە. حوكەیم بەسوارەكانی خۆی هێرشی دەكردە سەر ئەوان و بەردەوام دەیترساندن. لەدەروازەی دۆڵێكی بچوك شەڕی یەكتریان كرد و عایشە فەرمانی بەسوپاكەی خۆیدا و بەرەو لای راست ڕۆیشتن و ڕۆشتنە گۆڕستانی بەنی مازن و شەو دیوارێكی لەتاریكی لەنێوان دو سوپاكەدا دروست كرد. عوسمان بۆ كۆشكەكەی گەڕایەوە و هاوەڵانی عایشە رویان كردە پانتاییەكانی دارئەلرزق و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە كرد و خەڵك بەردەوام پەیوەستیان دەبون وئەوان لەدارئەلرزق (ماڵی رۆژی) كۆبونەوە. حوكەیم كوڕی جەبەلە بەرەبەیانی زو هێرشی كردە سەر ئەوان و بەردەوام جوێنی دەدا و ڕمەكەی لەدەستی خۆیدا رادەوەشاند. پیاوێك لەبەنی عەبدقەیس پێی وت: كێیە ئەو كەسەی بەردەوام جوێنی پێدەدەیت؟ وتی: عایشە. وتی: ئەی حەرامزادە، ئایا ئەم جوێنانە بەدایكی باوەڕداران دەڵێیت؟ حوكەیم بەڕم ئەوی كوشت. دواتر لای ژنێكەوە تێپەڕی و بەهەمان شێوە جوێنی بەعایشە دەدا. ژن وتی: ئەی خراپەكار، ئایا جوێن بەدایكی باوەڕداران دەدەیت؟ حوكەیم ئەویشی بەڕم كوشت و دواتر بەرێكەوت. هەردولا لەدارئەلرزق بۆ شەڕێكی قورس ریزیان بەست تا رۆژ بویەوە و كوژراوەكان لەناو هاوەڵانی عوسمان كوڕی حەنیف روی لەزیاد بون كرد و بریندارەكان لەهەردو فراوان. كاتێك شەڕ هەردو لای شەڕكەری بێزار كرد، داوای

ئاشتیان کرد و خوازیاری سازان بون. لەناو خۆیاندا نامەیەکیان نوسی لەسەر ئەو بنەمایەی کەسێك بۆ مەدینە ڕەوانە بکەن تا بپرسێت ئایا زوبەیر و تەڵحە بەزۆر بەیعەتیان کردوە یا بەرەزامەندی. ئەگەر ئەم دوانە بەزۆر بەیعەتیان کردبێت، عوسمان کوڕی حنیف لەبەسرە بڕواتەدەر و شارەکە تەسلیم بەوان بکات و ئەگەر بەدڵخواز بەیعەتیان کردبێت زوبەیر و تەڵحە لەشارەکە بڕۆنەدەر. لەنێوان خۆیاندا لەمبارەوە پەیمانێکیان بەست. کەعب کوڕی سوار بەرەو خەڵکانی مەدینە بەرێکەوت و دەستی بەپرسیار کردن لەوان کرد. کاتێك ڕۆشتە ناو شارەکە، خەڵك دەوریان گرت. رۆژی هەینی بو. هەستا و وتی: ئەی خەڵکانی مەدینە، من نێردراوی خەڵکی بەسرەم، لەئێوە دەپرسم، ئایا زوبەیر و تەڵحە بەزۆر یا لەترسا بەیعەتیان لەگەڵ عەلی کردوە یا بەرەزامەندی ئەو کارەیان ئەنجام داوە؟ کەس وەڵامی نەدایەوە جگە لەئوسامە کوڕی زەید کەهەستا و وتی: ئەم دوانە بەزۆر و لەترسا بەیعەتیان کردوە. تەمام کوڕی عەباس فەرمانیدا کەسەهل کوڕی حەنیف و خەڵك لەگەڵ ئەو شەڕیان کرد و صۆهەیب وئەبو ئەیوبی ئەنساری و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر و لەناو ئەوان محەممەد کوڕی موسلیمە کەترسان ئوسامە بکوژرێت، هەستان و وتیان: ئەی خوایە، بەڵێ. خەڵك وازیان لێ هێنا. صۆهەیب دەستی ئوسامەی گرت و بردیەوە بۆ ماڵ و وتی: ئایا نەتتوانی وەك ئێمە بێدەنگ بیت؟ ئوسامە وتی: گومانم نەدەکرد ئەم روداوەی لێبکەوێتەوە. کەعب کوڕی سوار گەڕایەوە و ئەم هەواڵە بەعەلی گەیشت. نامەیەکی بۆ عوسمان کوڕی حەنیف نوسی و ئەوی بەناتەوان لەقەڵەمدا و وتی: سوێند بەخوا ئەوانیان بەزۆر بۆ بەربڵاوی وپەرێشانی بانگ نەکرد بەڵکو بەکار و شەڕی بەکۆمەڵ و تێپەڕکردنی ڕێگەی ڕزگاری. ئەگەر دەیانەوێت پەیمانەکەی خۆیان بشکێنن بیانویان نیە و ئەگەر مەبەستەکەیان شتێکی دیکەیە، سەیریان دەکەین و دەستبەرداری ئەوان دەبین تا لەکارەکانی خۆیان ورد ببنەوە.

نامەی عەلی بەعوسمان گەیشت و کەعب کوڕی سوار لەمەدینە گەڕایەوە. هاوەڵانی عایشە کەسیان بۆ لای عوسمان نارد تا بڕواتەدەر و شارەکە تەسلیم بەوان بکات. عوسمان باسی نامەکەی عەلی کرد و وتی: ئەمە کارێکیترە کەئێمەی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە. زوبەیر و تەڵحە پیاوەکانی خۆیان لەشەوێکی تاریك و باراناوی و

تۆقاناوی کۆکردەوە و ئاهەنگی مزگەوتیان کرد و لەکاتی نوێژی خەوتنان ڕۆشتنە ناو مزگەوت. لەو کاتەدا خەڵك نوێژی خەوتنانیان کەمێك دوا دەخست. عوسمان درەنگی کرد و هاتنەدەرەوە بۆ نوێژی خەوتنانی دواخست. لەم کاتەدا قەرەجەکان و دەستگێرە گەڕۆکەکان شمشێریان کێشا و دەستیان بەکوشتاری نوێژکەران کرد. ئەوان هێرشیان کردە سەریان و دەستیان بەشەڕ کردن کرد تا هەموویان کوژران و ژمارەیان چل کەس بو. چەندین کەسیان ڕەوانەی لای عوسمان کرد تا بیبەنە لای ئەو دوانە (زوبەیر و تەڵحە). بەشەق تێیان هەڵدا و ئەوەندەیان ئازاردا مو بەروخساریەوە نەما. ئەم کارەیان بەناخۆش زانی و ڕەوانەی لای عایشەیان کرد و ئاگاداریان کردەوە. ئەو کەسی بۆ لای ئەم دوانە نارد و فەرمانیدا تا ئازادی بکەن.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك عوسمان دەستگیر کرا، کەسێکیان بۆ لای عایشە ڕەوانە کرد تا بزانن دەبێت چی لەگەڵدا بکەن. عایشە وتی: بیکوژن. ژنێك هەستا و بەعایشەی وت: سوێندت دەدەم بەهاوکاری کردنی عوسمان بۆ پێغەمبەر! عایشە وتی: بیخەنە زیندان. موجاشیع کوڕی مەسعود بەوانی وت: ئەشکەنجەی بدەن موی سەر و روخسار و برۆ و مژۆڵەکانی هەڵکەنن. چل قامچیان لێدا و موی ریش و مژۆڵ و برژانەگانیان هەڵکەند و ئەویان خستە زیندانەوە و دواتر ئازادیان کرد و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکریان وەك لێپرسراوی گەنجینە دەست نیشان کرد.

سەبارەت بەدەرکردنی عوسمان کوڕی حەنیف گێڕانەوەیەکی دیکەیش هەیە بەمشێوەیە: کاتێك عایشە و زوبەیر و تەڵحە ڕۆشتنە بەسرە، عایشە نامەیەکی بۆ زەید کوڕی صوحان نارد و نوسی: لەعایشە دایکی باوەڕداران و خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ کوڕە تایبەتەکەی زەید کوڕی صوحان. دوای سلاو، کاتێك نامەکەی من بەدەستی تۆ بگات، پەیوەستی ئێمە ببە و هاوکاریمان بکە و خەڵك لەشوێنکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالب دوربخەرەوە.

زدید نوسی: دوای سلاو، من کوڕی تایبەتی تۆم. ئەگەر خۆت بەدور بگریت وبۆ ماڵەوە بگەڕێیتەوە چ باشتر و گەرنە یەکەم کەس دەبم شمشێر لەروی تۆدا بەرز دەکەمەوە.

دوبارە زەید وتی: خوا لەدایکی باوەڕداران خۆش بێت! خوا پێی فەرمو لەماڵەکەی

خۆیدا بمێنێتەوە و فەرمانی بەئێمەدا شەڕ بکەین. ئەو فەرمانەی بەویان دابو، پشت گوێی خستو فەرمانی بەئێمەدا لەماڵەکانی خۆمان بمێنینەوە. ئەو کاری کەسانی دیکەی گرتە ئەستۆ و ئێمەی لەئەنجامدانی کارەکانمان دورخستەوە.

کاتێك عایشە ڕۆشتە ناو بەسرە، عوسمان کوڕی حەنیف فەرمانڕەوایی ئەم شارەی دەکرد. بەوانی وت: ڕەخنەتان لەسەروەری خۆتان گرتوە؟ وتیان: ئەو لەخۆمان بەشیاوتر بۆ فەرمانڕەوایی نازانین و جیاواز لەوە هەندێ کاری کردوە لەکەس داپۆشراو نیە. عوسمان وتی: پیاو منی وەك فەرمانداری بەسرە دەست نیشان کردوە، نامەی بۆ دەنوسم و ئاگاداری دەکەمەوە تا بزانم ئێوە بۆ چ کارێك هاتون لەسەر ئەو بنەماییەی پێشنوێژی خەڵك بم تا فەرمانی ئەو بگات.

ئەوان دەستیان لێهەڵگرت و عوسمان نامەی بۆ عەلی نوسی. دو یا سێ ڕۆژ زیاتر چاوەڕێیان نەکرد و لەشوێنێك بەناوی دارئەلرزق هێرشیان کردە سەری و بەسەریدا سەرکەوتن و ویستاین بیکوژن بەڵام لەتوڕەیی ئەنسار ترسان و موی سەر و ریش و برژانگیان هەڵکەند و خستیانە زیندانەوە. زوبەیر و تەڵحە قسەیان بۆ خەڵك کرد و وتیان: ئەی خەڵکانی بەسرە، گەڕانەوە بۆ لای خوا دوای گوناحکاری. ویستمان سەروەری باوەڕداران کەمێك سەرکۆنە بکەین بەڵام نەزانەکان بەسەر زاناکاندا زاڵبون و ئەویان کوشت! خەڵك بەتەڵحەیان وت: ئەی باوکی محەممەد، نامەکانی تۆ کەپێشتر بەدەستی ئێمەدەگەیشت، جیاواز لەم قسانە بو ئێستا باسیان دەکەیت. تەڵحە زمانی گیرا و زوبەیر هەستا و وتی: ئایا سەبارەت بەو نامەیەك لەمن بەئێوە گەیشتوە؟ ئەو باسی کوژرانی عوسمانی کرد و سەبارەت بەعەلی خراپەی وت. پیاوێك لەعەبدئەلقەیس هەستا و وتی: ئەی پیاو، بێدەنگ بە تا ئێمە قسە بکەین. زوبەیر بێدەنگ بو. پیاوی عەبدی وتی: ئەی خەڵکانی موهاجیر، ئێوە یەکەم کەسان بون بانگەوازەکەی پێغەمبەرتان وەڵام دایەوە. ئێوە لەم ڕێگاوە لەپێشتر بون. دواتر خەڵك هاوشێوەی ئێوە باوەڕیان بەئایینی ئیسلام هێنا. کاتێك پێغەمبەر مرد، لەگەڵ پیاوێك لەخۆتان پەیمانتان بەست و ئەوتان وەك فەرمانڕەوایی دەست نیشان کرد و ئێمە ڕازی بوین و فەرمانمان برد بەڵام ئێوە هیچ کارێکتان بەئێمە نەسپارد. خوا فەرمانڕەوایی ئەوی بەکۆتا گەیاند. ئەو مرد و کاتێك ویستی ماڵئاوایی لەجیهان بکات پیاوێکی دەست

نیشان کرد کەسەبارەت بەفەرمانڕەوایی ئەو لەگەڵ ئێمەدا راوێژتان نەکرد و ئێمە رازی بوین و فەرمانبرداریمان کرد. کاتێك ویستی بمرێت کاروباری ئێوەی بەشەش کەس سپارد و ئێوە لەناو ئەوان عوسمانتان هەڵبژارد و دواتر بێ راوێژ کردن بەئێمە لەگەڵ عەلی بەیعەتتان کرد. مەگەر چ کارێکی نارەوا لەعەلی بینراوە کەفەرمان بەشەڕ کردن لەگەڵ ئەو دەردەکەن؟ ئایا شتێکی لەگەنجینە هەڵگرتوە؟ کارێکی لەروی هەڵەوە ئەنجامداوە؟ ئایا کارێکی ئەنجامداوە کەپەسەندی ناکەن؟ لەسەر چ بنەمایەك لەگەڵ ئێوەدا بین؟ کەواتە ئەم هەمو هات و هاوارە بۆچیە؟ ویستیان ئەو پیاوە بکوژن بەلاَم کەسەکانی پارێزگاریان لێکرد. کاتێك بەیانی بویەوە، هێرشیان کردە سەر ئەو هاورێکانی و نزیکەی حەفتا کەس لەوانیان کوشت.

زوبەیر و تەڵحە دوای گرتنی عوسمان لەبەسرە مانەوە و دەستیان بەسەر گەنجینەکاندا گرت و خەڵك و پاسەوانەکانیان شوێن خۆیان خست و ئەوانەی لەگەڵ ئەمان یەکیان نەگرت، دورخرانەوە یا خرانە زیندانەوە.

ئەم هەواڵە بەحوکەیم کوڕی جەبەلە گەیشت کەتاوانباران لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف چیان کردوە. وتی: ئەگەر هاوکاری نەکەم، لەخوا نەترسم! (ئەگەر هاوکاری ئەو نەکەم،خواپەرەست و لەخوا ترس نەبم) لەگەڵ دەستەیەك لەبەنی عەبدقەیس و هاورێکانی خۆی لەرەبیعە هات و بەرەو لای رۆژخانە غاریدا. لەوێ خواردنی زۆری لێبو کەعەبدالله کوڕی زوبەیر دەیویست دەرخواردی کەسەکانی خۆی بدات. عەبدالله پێی وت: ئەی حوکەیم تۆ چیت بەسەر دێت؟ حوکەیم وتی: دەمانەوێت لەم رۆژیە بخۆین و دەمانەوێت عوسمان کوڕی حەنیف ئازاد بکەن تا لەکۆشکی فەرماندداری نیشتەجێ ببێت و لەسەر بنەمای ئەوەی پەیمانتان لەسەر بەستوە، فەرمانڕەوایی بکات تا فەرمانی عەلی بگات. سوێند بەخواوەندی خوا ئەگەر هاوەڵانم لێرە دەبون، بەمە لەبەرابەر ئێوە رازی نەدەبوم تا هەموی ئێوە لەبەرابەر مرۆڤ کوژیەکانتان بکوژم. ئێستا کارتان گەشتۆتە شوێنێك کەرشتنی خوێنتان لەبەرابەر ئەو کەسانەی کوشتوتانە، بۆ ئێمە ڕەوایە. لەخوا ناترسن؟ بۆ خوێنی بێ گوناحەکان دەرێژن؟ عەبدالله وتی: لەبەرابەر خوێنی عوسمان. حوکەیم وتی: ئەو کەسانەی فەرمانی کوشتنی ئەم بێ گوناحانەیان داوە، خۆیان عوسمانیان کوشت. ئایا لەتوڕەیی خوا

ناترسن؟ عەبداللە وتی: نە لەم رۆژیانە بەشی ئێوە دەدەین و نە عوسمان تا لەسەکار لابردنی عەلی ئازاد دەکەین. حوکەیم وتی: ئەی خوایە تۆ داوەرێکی دادپەروەریت، شایەت بە. بەهاوەلآنی خۆی وت: من لەراستی شەرکردن لەگەڵ ئەم خەلکە گومانم نیە. هەر کەس گومانی هەیە بگەڕێتەوە. ئەو هەنگاوی بردە پێش و بۆ شەڕ ریزی بەست. زوبەیر و تەڵحە وتیان: سوپاس بۆ خوا کەخوێنی ئێمەی لەناو خەلکانی بەسرە ئامادە کرد. خوایە یەك کەس لەوان بەزیندویی مەهێڵە. شەڕێکی قورسیان کرد. حوکەیم کوڕی جەبەلە چوار سوپاسالاری لەگەڵدا بو: حوکەیم لەبەرابەر تەڵحە، زەریح لەبەرابەر زوبەیر، کوڕی موحتەرەش لەبەرابەر عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب و حەرقوص کوڕی زوهەیر لەبەرابەر عەبدولرەحمان کوڕی حەرەس کوڕی هشام. تەڵحە هێرشی کردە سەر حوکەیم و ئەو سێسەد پیاوی شەڕکەری لەگەڵدا بو. حوکەیم شمشێری دەوەشاند و دەیوت:

اضربهم با ليابس          ضرب غلام عابس

من الحياة ايس          فی الغرفات نافس

یانی: بەشمشێری وشك لەوان دەدەم، لێدانی جوامێرێکی بوێر، لەم ژیانە بێهیوایە، شەیدای ماڵە بەهەشتیەکان لەسەر بنەمایی بەڵێن و مژدە.

پیاوێك شمشێری لەقاچی ئەودا و قرتاندی. ئەو چەمایەوە و قاچی هەلگرت و لەو پیاوەیدا و خستیە سەرزەوی و دواتر ڕۆشتە سەر سەری و کوشتی. وتی:

يا ساق لن تراعی          ان معی ذراعی

احمی به كراعی

یانی: ئەی قاچی من مەترسە، من بازوم لەگەڵدایە، بەوە جەستەی خۆم دەپارێزم

هەروەها وتی:

ليس علی ان اموت عار          و العار فی الناس هو الفرار

و المجد لا يفضحه الدمار

یانی: بۆ من شەرمێنەر نیە بمرم، شەرم ئەوەیە پیاو لەگۆڕەپان رابکات، گەورەیی لەناو نەبات و لەناوچون ریسوا نەکات.

پیاوێك لەدوایین ساتەكان هاتە سەر سەری و وتی: ئەی حوكەیم چیت بەسەر هاتوە؟ وتی: كوژرام.؟ پرسی: كێ تۆی كوشت؟ وتی: ئەو كەسەی پشتم پێ بەستبو. پیاو هەڵیگرت و لەگەڵ حەفتا لەپیاوەكانی بەرێی كرد. لەو رۆژەدا حوكەیم لەسەر یەك پێی خۆی وەستا و قسەی بۆ خەڵك كرد. شمشێرەكان هاورێكانی ئەویان گەمارۆدا و ئەو بێ هیچ هەڵەیەك لەزمان هاواری كرد و وتی: ئێمە ئاگادار بوین و ئەم دوانەمان (زوبەیر و تەڵحە) لەمەدینە بەجێهێشت و بەیعەتیان لەگەڵ عەلی كرد و دەستی فەرمانبرداریان بۆ ئەو درێژ كرد و دواتر هاوشێوەی دو شەڕخواز و ناسازگار دەركەوتن و خوازیاری خوێنی عوسمان كوڕی عەففان بون. لەنێوان ئێمە جیاییان دروست كرد و ئێمە لەیەك ماڵ بوین و دراوسێ بوین. ئەی خوایە، ئەمانە خوازیاری خوێنی ئەو نین! جارچیەك جاری لەو دا: ئەی پیاوی ناپاك، چۆن تۆڵەی خوا تۆی گرتەوە، بێ ئۆقرەییت كرد و پشتت بەوتەی كەسێك بەست كەتۆ و هاورێكانت بۆ كاروبارەكان راسپێرێت وئەمە لەبەرابەر كارێكدا بو بەسەر ئەو رێبەرە ستەملێكراوەتان هێنا و دەستەی خەڵكانتان بلاوە پێكرد و خوێنەكانتان ڕشت. تورەیی و رقی خوا بچێژە. هاورێكانی ئەو كوژران وئەویش لەگەڵیان كوژرا. یەزید كوڕی ئەسحەمی حودانی ئەوی كوشت. حوكەیمیان لەنێوان یەزید و براكەی كەعب بەكوژراوی دۆزیەوە.

دەستەیەك دەڵێن: پیاوێك بەناوی زۆخەیم ئەوی كوشت. هاورێ لەگەڵ ئەو ئەشرەف كوڕی حوكەیم وبراكەی رێعل كوڕی جەبەلە كوژران. كاتێك حوكەیمیان كوشت، ویستیان عوسمان كوڕی حەنیف بكوژن. بەوانی وت: ئاگادار بن براكەم سەهل كوڕی حەنیف لەمەدینەیە، ئەگەر بمكوژن، تۆڵەی من دەستێنێتەوە. ئازادیان كرد و عوسمان ئاهەنگی بارەگایی عەلی كرد. زەریح و هاورێكانیشی كوژران و حەرقوص لەگەڵ چەند كەسێك لەهاوەڵانی رزگاریان بو و پەنایان بۆ خەڵكەكەی خۆیان برد. دواتر كەسێك لەلایەن زوبەیر و تەڵحەوە هاواری كرد: هەركەس یا كەسان، هەركەس لەهێرشبەرانی مەدینەتان لایە، بۆ لای ئێمەی بێنن. ئەوانیان هێنا و زوبەیر و تەڵحە ئەوانیان كوشتار كرد و جگە لەحەرقوص كوڕی زوهەیر كەس رزگاری نەبو چونكە خەڵكەكەی بەنی سەعد ئەویان پاراست. ئەولەوان بو. بەنی سەعد لەم رێگاوە گیرۆدەوی كارێكی دژوار بون. خراپەخوازان، پێشەكیەكیان دیاری كرد و دڵی بەنی

سەعدیان لەبەر ئەوەی لایەنگرانی عوسمان بون، ئازاردا و رەنجاند. ئەوان خۆیان کێشایەوە. کاتێك بەنی سەعد لەسەر کوژراوەکانی خۆیان تورە بون، خەڵکانی بەنی عەبدقەیسیش لەسەر ئەوانەی دوای شەڕ لەگەڵ ئەوان کوژرابون، خرۆشان وئەو کەسانەی بۆ لای ئەوان رایان کردبو شۆرشیان کرد و لەم لاوە خۆیان بەڵێندار بەلایەنگری کردن وفەرمان بردن لەعەلی دەزانی. زوبەیر و تەڵحە فەرمانیان دا تا بەخشش و رۆژیەکانی خەڵك لەنێوانیاندا دابەش بکەن و گوێرایەڵان و فەرمانبەران زیاتریان پێببەخشن. خەڵکانی عەبدقەیس و دەستەیەك لەخەڵکانی بەکر کوڕی وایل هاتنەدەر چونکە ئەوانیان لەسامانەکان بێ بەش کردبو. بەرەو گەنجینە رۆشتن و هێرشیان کردە سەر گەنجینە وئەوەی توانیان بردیان و تاڵانیان کرد و بەرەو لای عەلی بەرێکەوتن. زوبەیر و تەڵحە مانەوە و بینیان تەنیا خوێنێکی ئەوان کەبەزیندویی ماوەتەوە، حەرقوص کوڕی زوهەیرە. ئەوان نامەیان بۆ خەڵکانی شام نوسی کەچیان کردوە و بارودۆخ گەیشتۆتە کوێ. عایشە نامەی بۆ خەڵکی کوفە نوسی و لەپێشهاتەکان ئاگاداری کردنەوە. فەرمانی بەواندا هاوکاری عەلی نەکەن. ئەوانی بۆتۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان هاندا. بۆ خەڵکانی مەدینە و یەمامیەکان نامەی نوسی و نامەکانی بەنێردراوەکانی خۆیدا رەوانە کرد.

ئەم روداوە، پێنج شەو بۆ کۆتایی رەبیع الثانی ساڵی ٣٦/ ٢٠ ئۆکتۆبەری ٦٥٦ زایینی رویدا.

خەڵکی بەسرە لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر بەیعەتیان کرد. کاتێك بەیعەت کۆتایی پێهات، زوبەیر وتی: لەکوێن هەزار سوارەی شەڕکەر تا هێرش بکەمە سەر عەلی وپێش ئەوەی بەئێمە بگات، لەبەیانی یا ئێوارێدا لەناوی ببەم. کەس وەڵامی نەدایەوە. زوبەیر وتی: ئەمە ئەو ئاژاوەیە بەردەوام لێی دەترسام و بەردەوام لەوبارەوە قسەم دەبیست. کۆیلەکەی پرسی: گەورەم، ئەوە بەئاژاوە ناودەبەیت ولە سەر ئەوە شەڕ دەکەیت؟ زوبەیر وتی: هاوار لەتۆ! ئێمە خەڵك بینا دەکەین بەلام خۆمان کوێرین. هیچ کارێك لەژیاندا بۆمن پێشنەهات مەگەر ئەوەی زانیم جێگە پێکانم لەکوێدایە، جگە لەم کارە کەنازانم هێرش بکەم یا پاشەکشێ بکەم. عەلقەمە کوڕی وەقاصی لەیسی دەڵێت: کاتێك زوبەیر و تەڵحە لەگەڵ عایشە هاتنەدەر، تەڵحەم بینی، چۆڵترین

و ئارامترین کوڕەکانی بو و بەردەوام ریشی خۆی لەسینەی دەکوتا( سەری دادەخست). پێم وت: ئەی باوکی محەممەد، دەبینم خۆشەویسترین کوڕەکان لای تۆ ئارامترینیانە. دەبینم بەردەوام سەردادەخەیت، ئەگەر کارێك پەسەند ناکەیت، خۆت بکێشەرەوە. دەڵێت: پێی وتم: ئەی عەلقەمە، رۆژگارێك بو یەك دەستمان بو و لەناکاو بوین بەدو کێوی ئاسن و دەستمان بەشوێنکەوتن و کوتانی یەکتر کرد. سەبارەت بەعوسمان گوناحێکم کرد کەلێخۆشبونی من تەنیا بەرژانی خوێنی من لەپاڵ خوێنەکەی ئەو ئەگەری دەبێت. وتم: کوڕەکەت محەممەد دور بخەرەوە چونکە تۆ سامان و زەوی وباخ و نانخۆری زۆرت هەیە. ئەگەر بەلایەك بەسەرتۆداهات، ئەو جێگری تۆ بێت. وتی: ئەو دورخەرەوە. دەڵێت: رۆشتمە لای کوڕەکەی محەممەد و پێم وت: باشترە تۆ بمێنیتەوە تا ئەگەر بەلایەك بەسەر باوکت هات جێگری ئەو لەسەر بنەماڵە و سامانەکەی ئەو بیت. محەممەد وتی: حەز ناکەم هەواڵی ئەو لەکاروانیان و رێبوارەکان بپرسم.

## ڕەوانە بونی عەلی بەرەو بەسرە

## شەڕی وشتر ( جمل )

پێشتر ئاماژەمان پێدا عەلی بەئامادە کردنی سوپای شەڕکەر بۆ شەڕی شامیەکان سەرقاڵ بو. لەوکاتەی بەم کارەوە سەرقاڵ بو، لەناکاو هەواڵ گەیشت زوبەیر و تەڵحە لەمەککە لەگەڵ عایشە سەرقاڵن. کاتێك ئەم هەواڵەی بیست، گەورەکانی مەدینەی کۆکردەوە و قسەی بۆ کردن. سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر وتی: کۆتایی ئەم کارە سامان نادرێت مەگەر بەوەی سەرەتاکەی سامان درا. هاریکاری خوا بکەن تا هاریکاریتان بکات وچاکسازی لەبارودۆختان بکات. خەڵك دودڵیان نیشاندا. کاتێك زیاد کوڕی حەنزەلە دودڵی خەڵکی بینی، بەرەو لای عەلی ڕۆشت و پێی وت: هەرکەس دودڵی نیشان بدات ئێمە دڵنیایی نیشان دەدەین و شان بەشانی تۆ شەڕ دەکەین. دوپیاوی چاکەکار لەگەورەکانی ئەنسار هەستان. یەکیان ئەبولهەیسەم کوڕی تەیەهان لەشەڕکەرانی بەدر و ئەویتریان خوزەیمە کوڕی سابت. دەستەیەك دەڵێن. ئەو هەمان زو ئەلشەهادەتەین بو. حەکەم دەڵێت: ئەو بەزوئەلشەهادەتەین ناو نەدەبرا بەڵکو زو ئەلشەهادەتەین لەڕۆژگاری عوسماندا مرد. ئەو هاوکاری عەلی کرد.

شەعبی دەڵێت: لەو ئاژاوەدا جگە لەشەش کەس لەشەڕکەرانی بەدر کەس لەشوێنەکەی خۆی نەجولا. سەعید کوڕی زەید دەڵێت: هیچ کات روی نەدا چوار لەهاوەڵانی پێغەمبەر بۆ یەك کار کۆببنەوە مەگەر ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالب یەکێك بو لەوان. ئەبو قەتادەی ئەنساری بەعەلی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەم تیغە تیژە پێغەمبەر لەکەمەری منی بەست. ڕۆژگارێکە لەناو کالاندایە بەلام ئێستا کاتی دەرهێنانیەتی لەبەرابەر بێدادگەران کەجگە لەزیان هیچ سودێکیان بۆ خەڵکان نیە. حەزم دەکرد من پێش بخەیت. من پێش کەسانیتر بۆ شەڕ ڕەوانە بکە. دایکی سەلەمە پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر هاتنەدەرەوە بۆ شەڕ بۆ ژنان ناڕەوا نەدەبو و تۆ ئەم گوناحە نابەخشیت و لێم خۆش نابیت، شان بەشانی تۆ شەڕم دەکرد. ئێستا ئەمە کوڕە مامی منە. سوێند بەخوا لەگیانم ئازیزترە. ئەو لەگەڵ تۆدا دێت و

لەهەمو شەڕەکان شان بەشانی تۆ شەڕ دەکات. کوڕە مامەکەی هاتەدەر و بەردەوام لەگەڵ عەلیدا بو. عەلی ئەوی وەك فەرمانداری بەحرەین دەست نیشان کرد بەڵام دواتر لایبرد و نەعمان کوڕی عێجلانی زورەقی لەجێگەکەی دانا. کاتێك عەلی ویستی بەرەو بەسرە بڕوات (و هیوادار بو زوبەیر و تەڵحە پێش گەیشتن بەبەسرە بگرێت و بیانگەڕێنێتەوە یا بیانکوژێت) لەکاتی ڕەوانە بون، تەمام کوڕی عەباسی لەمەدینە دانا و قەسەم کوڕی عەباسی لەمەککە. دەستەیەك دەڵێن: عەلی سەهل کوڕی حەنیفی لەمەدینە دانا و بەو ئامادەیی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ شامیەکان سامانیدابو، لەکۆتایی ڕەبیع الثانی ساڵی ٢٥/٣٦ ئۆکتۆبەری ٦٥٦ زایینی بەرەو بەسرە بەڕێکەوت. خوشکی عەلی کوڕی عودەی لەبەنی عەبد شەمس ئەم شێعرەی وت:

لاهم فاعقر بعلی جمله          و لا تبارك فی بعیر حمله

الا علی بن عدی لیس له

یانی: ئەی خوایە، لەسەر دەستی عەلی لەڕەگی وشترەکەی بدە و وشترێك کەئەو ریسوا دەکات، پیرۆزی پێ مەبەخشە. چونکە عەلی کوڕی عودەی لەگەڵ ئەودا نیە.

خەڵکانێکی چالاك لەکوفیەکان و خەڵکانی بەسرە بەشێوەیەکی بارسوك، نۆسەد کەس لەگەڵ ئەو هاتنەدەر. هیوای دەبرد ئەوان بگرێت وگەمارۆیان بدات و لەدەست درێژی کردنی ئەوان بۆ سەر خۆی ڕێگری بکات و ئەسیریان بکات. لەم کاتەدا عەبدالله کوڕی سەلام ئەوی بینی، جڵەوی ئەسپەکەی گرت و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەمەدینە مەڕۆ دەر چونکە ئەگەر بڕۆیت سوێند بەخوا هەرگیز فەرمانڕەوایی موسوڵمانان بۆ ئەم شارە ناگەڕێتەوە! خەڵك جوێنیان پێدا. عەلی فەرموی: وازی لێبێنن، ئەو لەهاوەڵانی محەممەدە.

بەڕێکەوت تا گەشتە ڕەبزە. کاتێك گەیشت، هەواڵی پێگەیشت کەئەوان پێش ئەو دەستیان بەسەر بەسرەدا گرتوە. لەوێ مایەوە و ڕاوێژی کرد تا چ کارێك ئەنجام بدات. کوڕەکەی حەسەن لەسەر ڕێگا هاتە لای و وتی: بەتۆم وت و فەرمانت لەمن نەبرد. بەیانی دەکوژرێیت و خوێنت بەفیڕۆ دەڕوات و هیچ هاوەڵێکت بۆ نامێنێتەوە. عەلی پێی وت: تۆ بەردەوام وەك کچەکان دەست بەگریان دەکەیت. چیت وت کەنافەرمانی تۆم کرد؟ حەسەن وتی: ئەو ڕۆژەی گەمارۆیان خستە سەر عوسمان، پێم وتی لەشار

بڕۆرەدەر تا لەکاتی کوژرانی ئەو لەشاردا نەبیت. دواتر کاتێك کوژرا، پێم وتی لەگەڵ خەڵك بەیعەت مەکە تا دەستەی نوێنەرایەتی عەرەبەکان بێنە لای تۆ و هەواڵی بەیعەت کردنی هەمو شارەکان بەتۆ بگات چونکە خەڵك هیچ کات تۆ پشت گوێ ناخەن و کارەکان بێ تۆ بەئەنجام ناگەیێنن بەڵام تۆ گوێت لەقسەکانی من نەگرت. کاتێك عایشە و ئەو دوپیاوە ڕۆشتنەدەر، پێم وتی لەماڵەوە دانیشیت تا ئەوان بەئاشتی بگەن وئەگەر خراپەکاری و گومڕایی دروست ببێت لەسەر دەستی تۆ نەبێت. لەهەمو ئەم کارانەدا قسەکانی منت لەبیر کرد.

عەلی وتی: کوڕەم! ئەوەی وتت: دەبوا لەکاتی گەمارۆ درانی عوسمان لەمەدینە دەرۆشتیتەدەر، بزانە ئێمەیشیان وەك ئەو گەمارۆدا. بەڵام ئەوەی کەوتت: دەبوا پێش گەیشتنی هەواڵی بەیعەتی شارەکانی دیکە بەیعەتم نەدەکرد، بزانە فەرمان فەرمانی خەڵکانی مەدینەیە و ئێمە ترساین ئەم کارە بەرەو لەناوچون بڕوات. پێغەمبەری خوا مرد و بڕوام وابو کەس لەمن بۆ خەلافەتی موسوڵمانان شیاوتر نیە بەڵام خەڵك لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان کرد و منیش بەیعەتم لەگەڵ کرد. دواتر کاتێك ئەبوبەکر مرد کەسم لەخۆم بۆ ئەم کارە بەشیاوتر نەدەبینی بەڵام کاتێك خەڵك لەگەڵ عومەر بەیعەتیان کرد، بەیعەتم کرد. عومەر ماڵئاوایی لەجیهان کرد و گومانم نەبو لەهەموان بۆ ڕێبەرایەتی شیاوترم. بەڵام ئەو یەك بەش لەسەر شەش بەشی بەمن بەخشی. خەڵك لەگەڵ عوسمان بەیعەتیان کرد و منیش شوێن ئەوان کەوتم. دواتر خەڵك هێرشیان کردە سەر عوسمان وئەویان کوشت وبە ڕەزامەندی وبێ زۆر و فشار لەگەڵ من بەیعەتیان کرد. ئێستا من لەگەڵ فەرمانبەرەکانم بۆ شەڕی ئەو کەسانە دەرۆم ڕێگەی ناسازگاریان لەگەڵ من گرتۆتەبەر تا خوا داوەری بکات چونکە باشترینی داوەرەکانە. بەڵام ئەوەی وتت لەکاتی ڕۆشتنەدەری تەڵحە و زوبەیر دەبوا لەماڵەوە دابنیشم، چۆن دەکرێت ئەوەی خوا لەئەستۆی منی داناوە، لەگەڵ مەبەستەکەی تۆدا کۆبکەمەوە. ئایا دەتەوێت وەك کەمتیار لەکونەکەی خۆمدا دانیشم تا گەمارۆی بدەن و بەردەوام بڵێن لەماڵەکەیدا نیە و کاتێك بگەنە بەر دەرگای کونەکەی، لەهەمان کات بێتەدەر و دەوری بگرن. ئەگەر لەم کارە ورد نەبمەوە کەچی لەسەر من پێویستە وخوا چ ئەرکێکی خستۆتە ئەستۆی من دەبێت چی بکەم و چی نەکەم، کێ ئەم کارە

دژوارانە بەڕێوەدەبات؟ واز لەمن بێنە کوڕم.

کاتێك عەلی گەیشتە ڕەبزە و هەواڵی کاری ئەو کەسانەی بیست، لەوێوە محەممەد کوڕی ئەبی بەکری صدیق و محەممەد کوڕی جەعفەری بۆ لای خەڵکانی کوفە ڕەوانە کرد و بەمشێوەیە بۆی نوسین: من لەپێشیم بەئێوە بەخشی لەبەرابەر خەڵکی شارەکانیتر و لەزیانی ئەوەی پێشهاتوە، پەنام بۆ ئێوە هێناوە. هاوەڵان و پەیمانداارانی دینی خواوەند بن و بەرەو لای ئێمە بەڕێکەون چونکە ئێمە بەدوای چاکسازیدا دەگەڕێین و دەمانەوێت خەڵکان هەموی برای یەکتر بن. چەند کەسێکی بۆ مەدینە ڕەوانە کرد، چوارپێ و کەل وپەلی شەڕ بەهەمو شێوەکانیەوە گەیشتن و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکران. عەلی لەناو خەڵك وتارێکدا و وتی: خوای گەورە و ڕێزدار بەئیسلام ئێمەی بەرێز کردوە، ئاڵای ئێمەی بەئیسلام هەڵکردوە و دوای ڕیسوایی و کەمتەرخەمی و رق هەڵگرتن و دوری لەیەکتر، ئێمەی لەسێبەری پیرۆزی ئیسلام کردۆتە برای یەك. خەڵك، تا ئەو کاتەی خوا ویستی، لەسەر ئەم ئایینە مانەوە: ئیسلام ئایینیان بو، ڕاستی و دروستی لەنێوانیان و نوسراوی خوایی ڕێبەری ئەوان تا ئەوەی ئەم پیاوە لەسەر دەستی ئەو کەسانە کوژرا کەدێو کاریگەری لەسەر دانان تا ئەم نومەتە لەیەك هەڵبوەشێننەوە و جیایی لەنێوان ئەوان دروست بکەن.

ئاگادار بن ئەم ئۆمەتەیش بەناچاری بڵاوەی لێدەکات و هەڵدەوەشێتەوە بەهەمان شێوە کەئۆمەتەکانی دیکە ئەو بەڵایان بەسەردا هاتوە. پەنا بۆ خوا دەبەین لەخراپی ڕوداوەکان. دواتر دوبارە وتارەکەی هێنایە سەرزمان و وتی: ئەوەی دەبێت ببێت، بەناچاری و بێ چەند و چون دەبێت ببێت. ئاگاداربن ئەم ئۆمەتە بۆ حەفتا و سێ بەش دابەش دەبێت و خراپترینیان ئەو دەستەیە من بکاتە ئایینی خۆی و بەشێوەی من کردار و هەڵس و کەوت نەکات. ئێوە بینیتان و هەستتان پێکرد. لەسەر دینەکەتان بەهێزبن و لەڕوناکی من ڕێنوێنی وەربگرن چونکە ڕوناکی پێغەمبەری ئێوەیە. لایەنگری لەشێوازی ئەو بکەن و لەوەی لەسەر ئێوە دژوار یا ئاڵۆز دەبێت خۆتان بەدور بگرن تا لەگەڵ قورئان بەرابەری بکەن. ئەوەی قورئان بیناسێت، پێی ڕازی ببن وئەوەی پەسەندی نەکات، مەیناسن و پاشەکشێ بکەن. خواوەندی جیهانیان بەخوایی، ئیسلام وەك دینی ڕاستی و دروستی، محەممەد وەك پێغەمبەر و قورئان وەك داوەر و

ڕێبەر قبوڵ بکەن.

کاتێك ویستی لەرەبزە بەرەو بەسرە بڕوات، یەکێك لەکوڕەکانی رەفاعە کوڕی رافع هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران دەتەوێت چی بکەیت وئێمە بۆ کوێ دەبەیت؟ فەرموی: ئەوەی مەبەستمانە و شوێنی دەکەوین چاکسازیە ئەگەر رازی بن و بانگەوازەکەی ئێمە وەڵام بدەنەوە. وتی: ئەگەر رازی نەبن؟ فەرموی: بەڵگەی تەواویان نیشان دەدەین وئەوان بۆ ڕێگەی راست و دروست ڕێنوێنی دەکەین و خۆڕاگر دەمێنینەوە؟ وتی: ئەگەر پەسەندیان نەکرد؟ وتی: تا ئەو کاتەی دەستدرێژی نەکەنە سەرمان دەست درێژی ناکەینە سەریان. وتی: ئەگەر دەستدرێژی بکەنە سەرمان؟ وتی: خۆمان دەپارێزین. وتی: ئەمە بەتەواوی راست و دروستە، ئێستا بەڵێ. حەجاج کوڕی غەزیەی ئەنساری هەستا و وتی: بێ گومان بەکردەوە تۆ رازی دەکەم بەهەمان شێوە کە بەوتار منت رازی کرد. دوبارە وتی:

دراكها دراكها قبل الفوت　　　　فانفر بنا و اسم بنا نحو الصوت

لا و الت نفسی ان کرهت الموت

یانی: تێگەیشتن، تێگەیشتن، پێش ئەوەی لەدەست بڕوات، ڕێبەریمان بکە و بەرەو بانگ وئاوازمان بەرە، گیانی من بەفیڕۆ بڕوات ئەگەر لەمردن ترسم هەبێت.

سوێند بەخوا هاوکاری خوا دەکەین، بەهەمان شێوە کەئێمەی بەئەنسار (هاورێیانی خوا) ناوبرد. لەو کاتەی عەلی هێشتا لەرەبزە بو، دەستەیەك لەهۆزی تەی هاتنە لای. بەعەلیان وت: ئەم خەڵکە دێنە لای تۆ، دەستەیەکیان دەیانەوێت لەگەڵ تۆدا شەڕ بکەن و دەستەیەکیان دەیانەوێت سڵاوت بۆ بنێرن و ڕێگەی خۆیان بگرنە بەر. عەلی فەرموی: خوا پاداشتی هەر دودەستەکە بداتەوە. خوا بەشەڕکەرانی لەبەرابەر دانیشتوان بەهرەیەکی لەپێشتری بەخشیوە. کاتێك هاتنە لای ئەو، بەوانی وت: بۆچ کارێك هاتونەتە سەردانی ئێمە؟ وتیان: بۆ هەر کارێك تۆ بتەوێت. عەلی وتی: خوا پاداشتی چاکەتان بداتەوە چونکە بەرەزامەندی باوەڕتان بەئیسلام هێنا و بەگیان ودڵ شەڕی هەڵگەڕاوەکانتان کرد وبەدانی زەکات لەکاتی خۆیدا هاوکاری موسوڵمانانتان کرد. لەم کاتەدا سەعید کوڕی عوبەیدی تایی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەناو خەڵکان کەسانێك هەن بتوانن ئەوەی لەدڵیاندایە بهێنە سەرزمان، سوێند بەخوا

من زمانی ئەوەم نیە نهێنیەکانی دڵم نیشان بدەم بەڵام بەتەواوی تێدەکۆشم و لەرێگەی خوادا هەوڵ دەدەم. من بەئاشکرا و نهێنی چاکەخوازی تۆ دەبم و لەهەمو شوێنێك لەگەڵ دوژمنانی تۆ شەڕ دەکەم و ئەوەندە راستی و دروستی لەتۆدا دەبینم، لەهیچ کەسێکی دیکەدا نایبینم و ئەمە بەهۆی رێزداری تۆ و خزمایەتی و نزیکی تۆ لەگەڵ پێغەمبەرە. عەلی فەرموی: خوا لێت خۆش بێت چونکە زمانت ئەوەی لەدڵتا بو ئاشکرای کرد. ئەو لەگەڵ عەلی لەشەڕی صەفین کوژرا.

عەلی لەرەبزەوە بەرێکەوت. فەرماندەی پێشەنگەکانی ئەبو لەیلی کوڕی عەمرۆ کوڕی جەراح بو و ئاڵاکەی لەدەست محەممەد کوڕی حەنیفە. عەلی سوار وشترێکی سور بو و ئەسپێکی بەدوای خۆیدا رادەکێشا.

کاتێك لەفەید دابەزی، خەڵکانی هۆزی تەی و ئەسەد رۆشتنە لای و ئامادەییان نیشاندا تا پەیوەستی شەڕکەران ببن. عەلی وتی: لەشوێنەکانی خۆتان ئارام بگرن چونکە تەنیا موهاجیرەکان بۆ ئەم کارە بەسن. لەفەید پیاوێك لەکوفە هاتە لای. عەلی پرسی: کێ بیت؟ وتی: عامر کوڕی مەتەری شەیبانی. فەرموی: من لەروداوەکانی پشت سەری خۆت ئاگادار بکەرەوە. هەواڵەکانی پێ وت. عەلی سەبارەت بەئەبوموسا ئەشعەری پرسیاری لێکرد. پیاو وتی: ئەگەر خوازیاری ئاشتیت، ئەبوموسا ئەشعەری پیاوی ئاشتیە و ئەگەر شەڕ هەڵدەبژێریت ئەو پیاوی ئەم کارە نیە. عەلی وتی: سوێند بەخوا خوازیاری ئاشتیم جگە لەوەم ناوێت مەگەر من ناچار بکەن.

کاتێك عەلی لەسەعلەبیە دابەزی، لەو پێشهاتانەی بەسەر عوسمان کوڕی حەنیف و هاوەڵانی هاتبو، ئاگاداریان کردەوە. ئەو هەواڵی ئەم پێشهاتانەی بەهاورێکانی خۆیدا و وتی: ئەی خوایە، من لەوەی تەڵحە و زوبەیرت پێ گرفتار کرد، دور بخەرەوە. کاتێك گەشتە ئێساد، هەواڵیان پێدا کەحوکەیم کوڕی جەبەلە کوژراوە و بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەففان هەمویان کوژراون. فەرموی: خوا گەورەیە بەڵام ئەگەر زوبەیر و تەڵحە بەخوێنی خۆیان بگەن، چی من لەوان دەپارێزێت! دواتر وتی:

دعا حكيم دعوة الزماع          حل بها منزلة النزاع

یانی: حوکەیم هاوشێوەی پیاوە بەهێزەکان بانگەوازی کرد و لەجێگەی پیاوە شەڕکەرەکان شەڕی کرد.

کاتێك گەیشتە زیقار، عوسمان کوڕی حەنیف ڕۆشتە لای و عەلی بینی هیچ مویەك بەروخساریەوە نیە. پێشتر ئاماژەمان پێدا. وتی: وەك کوڕێکی مو لێنەهاتو هاتمە لای تۆ! عەلی وتی: پاداشتی خوایی زۆرت پێبڕا. لەسەر ئەم خەڵکە پێش من دو کەس فەرمانڕەواییان کرد کەبەپێی نوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر هەڵس و کەوتیان کرد و دواتر سێیەمین پیاو گەیشت و سەبارەت بەو قسەیان کرد وئەنجامدانی چەندین کاریان بۆ ئەو گەڕاندەوە. دواتر خەڵك لەگەڵ من بەیعەیتان کرد و زوبەیر و تەڵحە لەناو ئەواندا بون. ئەم دوانە پەیمانی منیان شکاند و خەڵکیان دژی من هاندا. سەیرە فەرمانبرداری ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانیان کرد بەڵام نافەرمانی من دەکەن لەگەڵ ئەوەی دەزانن من لەو کەسانە پێگەیەکی کەمترم نیە. ئەی خوایە، ئەوەی ڕستویانە بیکەرەوە بەخوری و ئەوەی بەهێزیان کردوە، لاوازی بکە و ئەنجامی کارە خراپەکانیان بەوان نیشان بدە. ئەو لەزی قار مایەوە و چاوەڕوانی محەممەد و محەممەدی دەکرد. هەواڵی پێگەیشت چ بەڵایەك بەسەر خەڵکانی عەبدقەیس و ئەسەد هاتوە. فەرموی: عەبدقەیس باشترین خەڵکانی ڕەبیعەن و خەڵکی ڕەبیعە سەرچاوەی هەمو چاکیەکان. دوبارە وتی:

| | |
|---|---|
| یا لهف نفسی علی ربیعه | ربیعة السانعة المطیعه |
| قد سبقتنی فیهم الوقیعه | دعا علی دعوة سمیعه |

حلوا بها المنزلة الرفیعه

یانی: درێغ لەگیانی من بۆ خەڵکی ڕەبیعە، ڕەبیعەی گوێڕایەڵی فەرمانبردار، پێش ئەوەی من بگەم، پەیکی مەرگ ئەوانی گرتەوە. ئێستا عەلی بەشێوەیەك لەخوا دەپاڕێتەوە کەوەڵامی دەست کەوێت. وابێت لەبەرابەر ئەم کردارە ڕێزدارانە، بۆ پێگەیەکی بەرز، بەرز بکرێتەوە.

خەڵکانی بەکر کوڕی وایل ڕۆشتنە لای ئەو و ئامادەییان نیشاندا لەگەڵ ئەو شەڕ بکەن. هەمان قسەی بەوان وت کە بەخەڵکانی هۆزی تەی و ئەسەدی وت. محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی جەعفەر نامەی عەلیان بۆ ئەبوموسا برد و لەناو خەڵك دەستیان بەسامانداني کارەکانی ئەو کرد بەڵام کەس وەڵامی داواکاری ئەم دوانەی نەدایەوە. کاتێك شەو داهات، کەسانی بیرمەند، ڕۆشتنە لای ئەبوموسا

ئەشعەری وپێیان وت: سەبارەت بەڕۆشتنەدەر و شەڕ کردن شان بەشانی عەلی چی دەڵێیت؟ ئەبوموسا وتی: ئەوەی دوێنێ بۆچونێکی راست بو، ئەمڕۆ راست نیە. سستی و لاوازی ئێوە لەکارە پێویستەکانی رابردوی خۆتان، ئەو بەلایەی بەسەردا هێناون کەئەمڕۆ تالاوەکەی دەچێژن. ئەم کارە لەدوحاڵەت بەدەر نیە: دانیشتن یەکسانە لەگەڵ تێپەڕاندنی رێگەی ئەو دونیا و ڕۆشتنەدەر رێگەیەکە بۆ گەشتن بەمەبەستەکانی ئەم دنیا، مەبەستی خۆتان دیاری بکەن. کەس لەبەرژەوەندی ئەو هەڵنەستا. هەردو محەممەد تورە بون و بەتوندی قسەیان لەگەڵ ئەبوموسا کرد. ئەبو موسا وتی: سوێند بەخوا بەیعەتی عوسمان هێشتا لەئەستۆی من و لەئەستۆی فەرمانڕەواکەی ئێوەدایە. ئەگەر بەناچاری دەبێت شەڕ بکرێت، لەگەڵ کەس شەڕمان نەدەکرد تا لەکاری بکوژەکانی عوسمان لەهەر شوێنێك بێت، تەواو دەبوین.

ئەم دوانە گەڕانەوە بۆ لای عەلی لەزی قار و ئاگاداریان کردەوە. بەمالکی ئەشتەری وت: تۆ خاوەن و کارگوزاری ئێمە سەبارەت بەئەبوموسای ئەشعەریت و ناچاریت بەساماندانی بەهەر کارێك. لەگەڵ کوڕی عەباس بەرێکەوە و ئەوەی بەفیڕۆت داوە، چاك بکەرەوە. ئەم دوانە هاتنەدەر و ڕۆشتنە کوفە بۆ لای ئەبو موسا و قسەیان لەگەڵ کرد و لەم کارەدا هاوکاریان لەچەند کەسێکی خەڵکی کوفە وەرگرت. ئەبوموسا لەبەرابەر ئەوان دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، هاوەڵانی پێغەمبەر، ئەوانەی وەك من لەگەڵ ئەو رۆژگاریان بەسەربردوە، لەفەرمانی خوا وپێغەمبەرەکەی ئاگادارتر لەو کەسانەن کەهاورێیەتی ئەویان نەکردوە. ئێوە لەگەردنی ئێمەدا مافێکتان هەیە و من ئامۆژگاریەکی ئێوە دەکەم. بۆچون راست ئەوەبو شەڕ لەگەڵ فەرمانڕەوایی خوا نەکەن و ئەو کەسانەی لەمەدینەوە دێنە لاتان بیانگرن و بۆ ئەو شارەی بگەڕێننەوە تا هەمویان بۆ ئەو شارە بگەڕێنەوە چونکە ئەوان باشتر لەکەسانی دیکە دەزانن دەبێت رێبەرایەتی بەکێ بسپێردرێت. ئەمە ئاژاوەیەکەی کەڕ و کوێرە و دانیشتو باشترە لەوەستاو و وەستاو باشترە لەسوارە و سوارە باشترە لەتێکۆشەر. ئێو کۆڵەکەی بنچینەیی کاروباری عەرەبەکان بن و شمشێرەکانتان بکەنە کالان و ڕمەکان بێننە خوار و زێی کەوانەکان ببڕن و ستەملێکراوەکان پەنا بدەن تا ئەم کارە سامان بگرێت و ئەم ئاژاوەیە دامرکێتەوە.

کوڕی عەباس و مالکی ئەشتەر گەڕانەوە بۆ لای عەلی و لەچۆنیەتی کاروبارەکان ئاگاداریان کردەوە. ئەو حەسەنی کوڕی و عەمار کوڕی یاسری ڕەوانە کرد و بەعەماری وت: بڕۆ و ئەوەی بەفیڕۆت داوە، چاك بکەرەوە. ئەوان بەڕێکەوتن تا ڕۆشتنە ناو مزگەوت. یەکەم کەس ڕۆشتە لای ئەوان مەسروق کوڕی ئەجدەع بو و سڵاوی لەوان کرد. روی کردە عەمار و وتی: ئەی باوکی یەقزان، بە چ گوناحێك عوسمانتان کوشت؟ وتی: بەو گوناحەی جوێنی بەژن و منداڵەکانی ئێمە دەدا و روخسارمانی بەشەقەزللە سوردەکردەوە. باوکی ئەجدەع وتی: سوێند بەخوا زیاتر لەو ستەمەی لێتان کرا، سزاتان دا و ئەگەر خۆڕاگریتان دەکرد ئەم کارە بۆ خۆڕاگران باشتر دەبو. ئەبو موسا هاتەدەر و چاوی بەحەسەن کەوت و ئەوی لەئامێز گرت و روی کردە عەمار و وتی: ئەی باوکی یەقزان، ئایا تۆ هێرشت کردە سەر سەروەری باوەڕداران و خۆت خستە ریزی خراپەکاران؟ حەسەن قسەکەی پچڕاند و روی کردە ئەبوموسا و پێی وت: بۆ خەڵك لەهاوکاری کردنی ئێمە دور دەخەیتەوە؟ سوێند بەخوا ئێمە جگە لەچاکسازی هیچی دیکەمان ناوێت و کەسێکی وەك عەلی کوڕی ئەبی تالب ترسی ئەوەی لێ ناکرێت کارێکی هەڵنەسەنگێنراو ئەنجام بدات. ئەبو موسا وتی: باوك و دایکم قوربانی تۆبن، راستت کرد بەڵام ئەو کەسەی راوێژی پێبکەن دەبێت وەك ئەمیرێك قسە بکات. من لەپێغەمبەری خوام بیست دەیوت: بەزویی ئاژاوەیەك دروست دەبێت و تیایدا دانیشتو باشترە لەوەستاو، وەستاو باشترە لەو کەسەی دەڕوات وئەو کەسەی دەڕوات باشترە لەسوارە. خواوەند ئێمەی کردوٚتە برای یەك و خوێن و سامانی ئێمەی بۆ یەك ناڕەوا کردوە. عەمار تورە بو هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، پێغەمبەر ئەم پێشنیارەی تەنیا بەم پیاوە داوە. تۆ ئەگەر دانیشتو بیت باشترە لەوەی وەستاو بیت. پیاوێك لەبەنی تەمیم هەستا، جوێنی بەعەماردا و وتی: تۆ دوێنێ لەگەڵ ئاژاوەچیەکان بویت و ئەمڕۆ فەرماندارەکەی ئێمە بەنەزان لەقەڵەم دەدەیت! زەید کوڕی صوحان و کەسەکانی تورە بون و خەڵك خرۆشان و ئەبو موسا خەڵکی ئارام دەکردەوە. زەید کوڕی صوحان لەبەردەگای مزگەوت وەستا و دونامەی لەعایشە دەرهێنا: یەکیان بۆ خۆی کەداوای لێدەکرد یاهاوکاری زوبەیر و تەڵحە بکات یا لەماڵەوە دانیشێت ویەکیان بۆ خەڵکی کوفە بەهەمان فەرمان. دو نامەکەی دەرهێنا وبۆ خەڵکی خوێندەوە و

دواتر وتی: خوا فەرمانی بەم ژنەداوە لەماڵەکەی ئارام بگرێت (احزاب/٣٣/٣٣) و فەرمانی بەئێمەدا شەڕ بکەین تا ئاژاوەیەك لەئارادا نەبێت (بقره/٢/١٩٣). ئێستا ئەمە ژنە فەرمانی کارێك بەئێمەدەکات کەدەبێت خۆی بیکات و خۆی کارێك ئەنجام دەدات کەدەبێت ئێمە ئەنجامی بدەین. شەبس کوڕی رەبعی وتی: ئەی پیاوی عەمانی، لەجەلەولا دزیت کرد و دەستی تۆیان بڕی و ئێستا نافەرمانی دایکی باوەڕداران دەکەیت و خەڵك فریو دەدەیت و بەرەو لەناوچونیان دەبەیت!

دوبارە ئەبوموسا هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، فەرمانی من بەکار بەرن کۆڵەکەیەکی بنچینەیی لەکۆڵەکەی عەرەبەکان بن تا ستەملێکراو پەنا بۆ ئێوە بێنێت و ترساو لەشارەکانی ئێوەدا ئارام بگرێت.

ئاژاوە روبکاتە هەر شوێنێك نەناسراوە و کاتێك بەسەر دەچێت، ئاشکرا دەبێت. ئەم ئاژاوە، زیانێك هاوشێوەی ژانە سکە. لەبەر ئەم ئاژاوەیە باکانی باکور و باشور و رۆژهەڵات و رۆژئاوا هەڵدەکەن و فرمزان هاوشێوەی پیاوێکی پیر وبەتەمەن سەرگەردان دەکەن. شمشێرەکانتان بکەنە کاڵان، رمەکانتان بشکێنن، زێی کەوانەکانتان ببڕن و لەماڵە مەڕۆنەدەر. ئەگەر قورەیشیەکان پێداگری بکەن کە لەشوێنی کۆچ کردن (دارالهجر) خۆیان بەدور بگرن و ئاگاکان لەکاری فەرمانڕەواکان لەبەرچاو نەگرن، وازیان لێ بێنن. من بەچاکەخوازی خۆتان بزانن وبە خراپە خوازم مەزانن. فەرمانبرداری من بکەن تا ئەم دنیا وئەو دنیاتان ئاوەدان بێت و کەسێك لەناو ئاگری ئەم ئاژاوەدا بسوێتێت کەهەڵیکردوە.

زەید کوڕی صوحان هەستا و دەستە بڕاوەکەی خۆی نیشاندا و وتی: ئەی عەبداللە کوڕی قەیس (ئەبوموسا ئەشعەری) فورات لەناو روبارەکە بۆ سەرەوە بگەڕێنەوە، بۆ سەرچاوەکەی بگەڕێنەوە تا بەهەمان شێوە کەدێت، بۆ دواوە بڕوات. ئەگەر بتوانی ئەم کارە بکەیت، بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکەیشت بەتوانا دەبیت. ئەوەی توانایی ئەنجامدانیت نیە، لەخۆت دوری بخەرەوە! پەلە بکەن ئەی خەڵکینە بۆ لای سەروەری باوەڕداران، بۆ لای رێبەری موسوڵمانان، هەموان پەلە بکەن تا هەتاوی راستی و دروستی تیشکی بەسەر هەمواندا بڵاو بکاتەوە لەهەر کەنارێکەوە.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ هەستا و وتی: من چاکەخوازی ئێوەم و بەمیهرەبانی

ئامۆژگاریتان دەکەم. دەمەوێت بەرێگەی راستدا برۆن، قسەیەك لەگەڵ ئێوە دەکەم هەموی راستی و دروستی بێت. ئەوەی فەرماندار وتی: راست و دروستە. بەڵام ئەوەی زەید وتی: لەبەر ئەوەیە چونکە دوژمنی چارەنوسی خەڵکە. داوای ئامۆژگاری و چاکەخوازی لەو مەکەن. وتارێك کەراست و دروست بێت ئەوەیە دەبێت لەهەر سەرزەمینێك شێوازێك لەفەرمانڕەوایی دروست ببێت تا کاری خەڵك سەروسامان بدات و ستەمکارەکان دامرکێنێتەوە و رێزداری بەستەملێکراوەکان ببەخشێت. ئەو کەسە سەروەری باوەڕدارانە کە لەسەر بنەمایی ئەو فەرمانە خوایی و خەڵکەیەی لەئەستۆیدایە، بەکارەکانی هەڵدەستێت. ئەو دادپەروەرانە داوای هاوکاری لەئێوە کردوە چونکە داوای چاکسازی دەکات. رەوانە ببن وبۆ شوێنێك برۆن تا ئەم کارە لەنزیکەوە ببینن و ببیستن.

عەبدئەلخەیری خەیرانی وتی: ئەی ئەبوموسا، ئایا زوبەیر و تەڵحە بەیعەتیان کردوە؟ وتی: بەڵێ. پرسی: ئایا عەلی کارێکی کردوە شکاندنی پەیمانەکەیان رەوا بێت؟ وتی: نازانم. وتی: هیوادرام نەزان بمێنیتەوە. ئێمە دەستبەردارت دەبین تا زانایی بەدەست بێنیت.؟ ئایا کەسێك لەدەرەوەی ئەم ئاژاوە دەناسیت؟ خەڵك لەم کارەدا چوار دەستەن: عەلی لەدەرەوەی کوفەیە، زوبەیر و تەڵحە لەبەسرەن، معاویە لەشامە و کەسانێك لەحیجازن کەهیچ نیازێك ناهێننەدی و کەس لەشەردا هاوکاری ئەوان ناکات. ئەبوموسا وتی: ئەوانە باشترینی خەڵکانن. ئەمە ئاژاوەیە. عەبدئەلخەیر وتی: ئەی ئەبوموسا، خراپی و خراپەخوازی بەسەر تۆدا زاڵبوە! سیحان کوڕی صوحان وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم کارە و کۆمەڵە سەرگەردانەکانی خەڵك پێویستیان بەفەرمانڕەواییەکە تا ستەمکار لەناو ببات و ستەملێکراو رزگاری ببەخشێت. ئێستا فەرمانڕەواکەتان داواتان لێدەکات برۆنە لای ئەو و لەکاری دو دژومنەکەی ورد ببنەوە. ئەو ئەمینی ئەم ئۆمەتە و شارەزای شەرع و پرسیارە دینیەکانە. هەرکەس دەیەوێت هەستێت چونکە ئێمە بەرەو لای ئەو بەرێدەکەوین. کاتێك سیحان لەوتارەکەی تەواو بو، عەممار کوڕی یاسر هەستا و وتی: ئێستا ئەوە کوڕە مامی پێغەمبەری خوایە ئێوە بۆ روبەروبونەوەی هاوسەری پێغەمبەر بانگ دەکات و بۆ شەڕ لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر رێنوێیتان دەکات. من شایەتی دەدەم ئەم ژنە لەم دنیا و لەو دنیا هاوسەری ئەوە. بەراستی و دروستی

بڕوانن و دوباره ورد ببنەوە و بۆ شەڕکردن شان بەشانی ئەو پەلە بکەن. پیاوێك وتی: ئێمە لەگەڵ ئەو کەسەین مژدەی بەهەشتیان پێداوە و دژی ئەو کەسەیان مژدەیان پێ نەبەخشیوە. حەسەن وتی: دەست لەئێمە هەڵبگرە چونکە چاکسازی کەسانی شیاوی دەوێت. دوباره حەسەن کوڕی عەلی هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە وەڵامی داواکاری فەرمانڕەواکەتان بدەنەوە و بڕۆنە لای براکانتان چونکە بۆ ئەم کارە خوازراو یا نەخوازراو کەسانێك دەست دەکەون هاوکاری بکەن (کەواتە باشترە ئێوە ئەو کەسانە بن) سوێند بەخوا ئەگەر بیرمەندەکان جڵەوی کاروبارەکان بگرنە دەست هەم بۆ ئەم دنیا باشترە هەم بۆ ئەو دنیا و هەم بۆ ئەنجامی کارەکانی خۆتان. داواکاریەکەی ئێمە وەڵام بدەنەوە و بۆچارەسەرکردنی ئەوەی ئێمە و ئێوە پێی گرفتارین، هاوکاریمان بکەن. عەلی کوڕی ئەبی تالب دەڵێت: من بۆ ئەم کارە یا وەك ستەمکار هاتوم یا ستەملێکراو. من بۆ هەر کەسێك بیەوێت ڕێز لەماڤ خوا بگرێت، خوای بیردەخەمەوە تا هەستێت و هاوکاریمان بکات. ئەگەر من ستەملێکراوبم هاوکاریم بکات و ئەگەر ستەمکار بم دادی خۆی لەمن وەربگرێت. سوێند بەخوا زوبەیر و تەڵحە یەکەم کەسان بون بەیعەتیان لەگەڵ من کرد و یەکەم کەسان بون پەیمانەکەی خۆیان شکاند. ئایا سامانەکانم تایبەت کردوە بەخۆم یا نافەرمانی خوام کردوە؟ هەستن وبەرێکەون و بۆ کارەچاکەکان خەڵك ناچار بکەن و لەخراپەکان دوریان بخەنەوە. خەڵك ئارامیان گرت و وەڵامیان دایەوە و ڕەزامەندیان نیشاندا. کەسانێك لەخەڵکی تەی ڕۆشتنە لای عودەی کوڕی حاتەم و وتیان: چی دەبینیت و فەرمانی چی دەدەیت؟ وتی: ئێمە لەگەڵ ئەم پیاوە بەیعەتمان کردوە و ئەویش داوای چاکەمان لێدەکات و لەئێمەی دەوێت بڕۆین ولەنزیکەوە لەم روداوە قووڵە ورد ببینەوە. ئێستا ئێمە بەرێدەکەوین و لەم کارە ورددەبینەوە. هند کوڕی عەمرۆ هەستا و وتی: سەرورەی باوەڕداران داوای هاوکاری لەئێمە کردوە و نێردراوەکانی خۆی ڕەوانە کردوە و دوای هەمویان کوڕەکەی خۆی ناردوە. گوێ لەوتارەکانی بگرن و فەرمانەکانی ئەنجام بدەن و بڕۆنە لای ئەو و لەگەڵ ئەو لەم کارە ورد ببنەوە و بەبۆچونەکانی خۆتان هاوکاری بکەن.

حیجر کوڕی عودەی هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، وەڵامی داواکاری سەرورەی باوەڕداران بدەنەوەو بارسوك یا بارقورس بەرەو لای ئەو بەرێکەون. بەرێکەون و من

یەکەم کەسم بۆ لای ئەو دەفرم. حەسەن وتی: ئەی خەڵکینە من بەیانی بەرێدەکەوم، هەرکەس دەیەوێت لەرێگەی وشکانیەوە بێت و هەر کەس دەیەوێت لەرێگەی روبارەوە بێت. لەگەڵ ئەو نزیکەی نۆهەزار کەس هاتنەدەر، شەش هەزار و دوسەد کەس لەرێگەی وشکانی و دوهەزار و چوار سەد کەس لەرێگەی روبار.

دەستەیەك دەڵێن: عەلی دوای کورەکەی حەسەن و عەماری یاسر، مالکی رەوانەی کوفە کرد. ئەو رۆشتە ئەم شارە و خەڵك لەمزگەوتا بون وئەبو موسا قسەی بۆ ئەوان دەکرد و داوای لێدەکردن هاوکاری عەلی نەکەن و حەسەن و عەمار شەرِیان لەگەڵ دەکرد و خەڵکان گرفتار و سەرلێشێواو بون. مالکی ئەشتەر لای هەر هۆزێکەوە تێدەپەری، داوای هاوکاری لەوان دەکرد و دەیوت: بەدوای من بۆ کۆشکی فەرمانداری وەرن. ئەو لەگەڵ دەستەیەك گەیشتە کۆشکی فەرمانداری. رۆشتە ناو وئەبو موسا لەمزگەوتا بو و قسەی بۆخەڵك دەکرد و داوای لێدەکرد هاوکاری عەلی نەکەن و حەسەن دەیوت: ئەی بێ دایك، خۆت لەئێمە بەدور بگرە! لەسەر تەختی وتاردان وەرە خوارا عەماریش مشتومری لەگەڵ دەکرد. ئەشتەر کۆیلەکانی ئەبوموسای لەکۆشکەکەی دەرکرد. ئەوان بەراکردن هاتن و وتیان: ئەی ئەبوموسا مالکی ئەشتەرە هاتۆتە ناو کۆشك و لەئێمەی داوە و دەریکردوین. مالکی ئەشتەر بانگی کرد: ئەی بێ دایك، بڕۆرەدەر خوا گیان لەجەستەت بگرێت! ئەبوموسا وتی: یەك شەو مۆڵەتم پێبدە. ئەشتەر وتی: باشە بەلاّم نابێت ئەمشەو لەکۆشك بەسەر ببەیت! خەڵك رۆشتنە ناو دەستیان بەتالاّن کردنی کەل و پەلەکانی ئەبوموسا کرد. ئەشتەر رێگەی لێگرتن و وتی: من پەنادەری ئەوم. خەڵک دەستیان لێهەڵگرت. دواتر خەڵك لەگەڵ ئەوان رۆشتنەدەر.

دەستەیەك دەڵێن: ژمارەی ئەو کەسانەی لەکوفە رۆشتنەدەر، ١٢ هەزار ویەك کەس بو. ئەبو تۆفەیل دەڵێت: لەعەلیم بیست کەپێش هاتن باسی ژمارەکەی ئەوانی دەکرد. من لەسەر رێگای ئەوان دانیشتم و یەك یەك ئەوانم ژمارد و یەك کەس کەم و زیاد نەبون. فەرماندەکانیان ئەمانە بون: فەرماندەی کەنانە وئەسەد و تەمیم و رێباب و موزەینە لەدەستی مەعقەل کوری یەساری ریاحی، فەرماندەی سەبع قەیس سەعد کوری مەسعودی سەقەفی مامی موختار، فەرماندەی بەکر و تەغلەب وەعلە کوری

مەحدوجی زوهەلی، فەرماندەی مەزجەح ئەشعەر کوڕی حجر کوڕی عودەی و فەرماندەی بەجیلە وئەمار و خەصعەم وئەزد موخەنەف کوڕی سولەیمی ئەزدی. ئەوان لەزی قار ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالب. عەلی هاورێ لەگەڵ چەند کەس لەهاوەڵانی و لەناو ئەوان کوڕی عەباس پێشوازی لێکردن و بەخێری هێنان و وتی: ئەی خەڵکی کوفە، ئێوە لەگەڵ پاشاکانی ئێران شەڕتان کرد و سوپای ئەوانتان تێکشکاند تا میراتیان کەوتە دەستی ئێوە. دواتر سەرزەمینەکانی خۆتان پاراست و لەبەرابەر دوژمنان هاوکاری خەڵکتان کرد. ئێستا ئێوەم بانگ کردوە تا لەروبەروبونەوەی ئێمە لەگەڵ براکانمان لەبەسرە شایەت بن. ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، ئەو شتەیە کەدەمانەوێت وئەگەر سەرسەختی وپێداگری بکەن، بەمیهرەبانی چارەسەریان دەکەین تا دەست درێژی بکەنە سەر ئێمە. هەر کارێك ببێتە هۆی چاکسازی و گۆڕان، پێشی دەخەین لەبەرابەر هەر کارێك کەببێتە هۆی فیرۆیی و لەناوچون. ئەوان لەزی قار لای ئەو کۆبونەوە و هەمو خەڵکی عەبدئەلقەیس لەسەر ڕێگای عەلی تا بەسرە بون کەژمارەیان بەچەند هەزار کەس دەگەیشت و چاوەڕوانی عەلیان دەکرد تا پەیوەستی ببن.

سەرکردەی سوپایی کوفیەکان ئەمانە بون: قەعقاع کوڕی عەمرۆ و سەعد کوڕی مالك و هند کوڕی عەمرۆ و هەیسەم کوڕی شیهاب. فەرماندەی هێزە کۆکراوەکان ئەمانە بون: زەید کوڕی صوحان و مالکی ئەشتەر و عودەی کوڕی حاتەم و موسەییب کوڕی نەجبە و یەزید کوڕی قەیس و کەسانی تر کەپێگەی نزمتریان لەوان نەبو بەلام بۆ فەرماندەیی دەست نیشان نەکران و یەکێك لەوان حجر کوڕی عودەی بو. کاتێك لەزی قار دابەزین، عەلی قەعقاعی بانگ کرد وئەوی بۆ لای خەڵکانی بەسرە ڕەوانە کرد و وتی: سەردانی ئەو دوپیاوە بکە. قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەهاوەڵانی پێغەمبەر بو. پێی فەرمو: داوای یەکگرتن و هاوپەیمانی لەگەڵ خەڵکیان لێبکە و پەرێشانی وبەربلاوی لەبەرچاوی ئەوان گەورە بکە. عەلی لێی پرسی: ئەگەر ڕوبەڕوی پرسیارێك ببێتەوە کەمن سەبارەت بەو پرسیارە هیچ پێشنیارێکم پێ نەکردبێتیت، چی دەکەیت؟ وتی: لەسەر بنەمای ئەوەی فەرمانت دا، گفتوگۆیان لەگەڵ دەکەین و ئەگەر وتار یا کردارێك لەوان ببینرێت کەهیچ پێشنیارێکی تۆی لەسەر نەبێت، ئەندێشەی

خۆمان دەخەینەگەڕ و لەسەر بنەمای ئەوەی دەیبیستین و دەیبینین و ئەوەی لەئێمە دەوەشێتەوە و شیاو، کار دەکەین. عەلی وتی: تۆ پیاوی ئەم کارەیت. قەعقاع ڕۆشتەدەر و بەرێکەوت تا گەیشتە بەسرە. سەرەتا ڕۆشتە لای عایشە، سڵاوی لێکرد و پرسی: دایە گیان، چ هۆکارێك بۆتە هۆی ئەوەی ماڵەکەت بەجێبێڵیت و بۆچی هاتویتە ئەم شارە؟.عایشە وتی: کوڕم، چاکسازی لەناو خەڵك. قەعقاع وتی: کەس بۆ لای زوبەیر و تەڵحە بنێرە تاوتاری من و قسەکانی ئەوان ببیستیت. عایشە کەسێکی بەدوای ئەواندا نارد و هاتن و قەعقاع بەوانی وت: من لەدایکی باوەڕدارانم پرسی بۆچی بۆ ئێرە هاتوە و ئەو وتی: بۆ چاکسازی لەناو خەڵك. ئێوە دوانە چی دەڵێن؟ ئایا شوێنکەوتەیی ئەون یا ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەو دەگرنە بەر؟ وتیان: شوێنکەوتەیی ئەوین. قەعقاع وتی: ئێستا بەمن بڵێن ئەمە چ جۆر چاکسازیەکە ئێوە پێی هەستاون؟ سوێند بەخوا ئەگەر بەباشی بزانین پێی ڕازی دەبین و ئەگەر بەناپەسەندنی بزانین، خۆمانی لێ بەدور دەگرین. زوبەیر و تەڵحە وتیان: بەدوای بکوژەکانی عوسماندا دەگەڕێین چونکە ئەگەر دەست لەشوێنکەوتنی ئەوان هەڵبگرین قورئانمان پشت گوێ خستوە. قەعقاع وتی: بکوژەکانی ئەو لەخەڵکی بەسرەتان کوشت بەڵام پێش ئەوەی ئەو کارە بکەن بەهێزترن بون لەئێستاتان. شەشسەد پیاوتان کوشت و ئێستا شەش هەزار کەس داوای تۆڵەی خوێنی ئەوان دەکەن. ئەوان خۆیان لەئێوە دورخستۆتەوە و ئێوەیان بەجێهێشتوە. شوێن حەرقوص کوڕی زوهەیر کەوتن و شەش هەزار کەس پارێزگاریان لێکرد. ئێستا ئەگەر دەستبەرداری ئەوان ببن وتار و کردارەکەی خۆتان پشت گوێ خستەوە و ئەگەر لەگەڵ ئەوان و ئەو شەش هەزار کەسی ئێوەیان بەجێ هێشتوە، شەڕ بکەن، تۆڵەتان لێدەسێننەوە و ڕۆژگارتان ڕەش دەکەن. ئەوەی خۆتان لێ بەدور دەگرت و ئەوەی بەهۆیەوە هێزتان بەکارەکەتان دەبەخشی، دژوارتر لەوەیە بەناخۆشی بزانن. ئەگەر خەڵکانی موزێر ورەبیعە لەم شارە دوربخەنەوە، بۆ شەر لەگەڵ ئێوە دەبنە هاوپەیمانی یەك. هاوکاری نەکردنی ئێوە یا هاوکاری نەکردنی ئەوان بۆ ئێوە، یەکسانە لەگەڵ سەرکەوتنی ئەم خەڵکە بەهەمان شێوە کەئەوان بۆ خاوەنانی ئەم کارە دژوار و گوناحە گەورەیە کۆبونەتەوە.

عایشە وتی: تۆ خۆت چی دەڵێیت؟ قەعقاع وتی: دەڵێم، دەرمانی ئەم دەردە ئارام

کردنەوەیە، کاتێك ئەم کارە ئارام بگرێت، ئەوان دادەمرکێنەوە. ئەگەر ئێوە بەیعەت بکەن، نیشانەی مێهرەبانی و هۆکاری گەیشتن بەتۆڵەسەندنەوەیە. بەڵام ئەگەر تەنیا پشت بەشەڕ کردن ببەستن و لەم کارەدا پێداگری وسەرسەختی بکەن، نیشانەی زیان و لەناوچونی ئەم هەمو سامانەیە. تەندروستی و رزگاری هەڵبژێرن تا بەئێوەی ببەخشن. هۆکارێك بن بۆ باشی و چاکسازی بەهەمان شێوە کەپێشتر بون. خۆتان مەکەنە نیشانە بۆ گرفتاری و زیان چونکە یەخەتان دەگرێت ولەزمویتان دەدات و هەروەها ئێمەیش. سوێند بەخوا ئەم قسانە لەچاکخوازیەوە دەکەم و لەرێگەی هاورێیەتی و دۆستایەتی داوا لەئێوە دەکەم. دەترسم ئەم کارە سامان نەدرێت مەگەر دوای ئەوەی خوا دادی خۆی لەم ئۆمەتە وەربگرێت کەخواست و پێداویستیەکانی روی لەکەمبونە و ئەو بەڵایەی بەسەرداهاتوە، کەدەیبینن. ئەم پێشهاتەی ئێستا رویداوە، شیاوی پێشوازی کردن نیە و ناتوانین بزانین لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت و بەکوێ دەگات. ئەمە لەبەر ئەوە نیە پیاوێك پیاوێکی کوشتوە یا چەند کەس یا خەڵکی هۆزێك پیاوێکیان کوشتوە. وتیان: بەمەبەستەکەی خۆت گەشتیت و پەیامێکی جوانت پێشکەش کرد. ئەگەر عەلی بێت و بۆچونێکی هاوشێوەی تۆی هەبێت، کارەکان دروست دەبێت.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ بۆ لای عەلی گەڕایەوە و ئەوی لەچۆنیەتی کاروبارەکان ئاگادار کردەوە و عەلی کارەکەی پەسەند کرد. خەڵك لەئاشتی نزیك بونەوە بێ ترس لەوەی چ کەسانێك پێیان خۆشە و چ کەسانێك پێیان ناخۆشە. دەستەی نوێنەرایەتی عەرەب لەخەڵکانی بەسرە لەزی قار ڕۆشتنە لای عەلی و ئەمە لەدوای گەڕانەوەی قەعقاع بو. دەیانویست بزانن بۆچونی براکانیان لەکوفە چیە و بۆ چ کارێك بەرابەر بەوان ریزیان بەستوە، دەیانویست ئاگاداریان بکەنەوە بۆچونی ئەوان لەسەر ئاشتی و چاکسازیە و ئەندێشەی شەڕکردن لەگەڵ ئەوان بەمێشکی هیچ کەسێدا ناگوزەرێت.

کاتێك چاویان بەخزم و کەسەکانی خۆیان لەخەڵکانی کوفە کەوت، کوفیەکان وتارێکی هاوشێوەی وتارەکەی خۆیانیان پێ وتن و ئەوانیان بردە لای عەلی و لەکارەکان ئاگاداریان کردەوە. عەلی لەجەریر کوڕی شەرەسی پرسی زوبەیر و تەڵحە بەچیەوە سەرقاڵن. ئەو ورد و درشتی کارەکانی ئەوانی بەعەلی وت. پێی وت: زوبەیر،

بەردەوام دەڵێت: بەزۆر بەیعەتم کرد بەڵام تەڵحە بەردەوام شێعر دەخوێنێت و لەناویاندا ئەمانە دێنێتە سەر زمان:

| | |
|---|---|
| الا ابلغ بنی بکر رسولا | فلیس الی بنی کعب سبیل |
| سیرجع ظلمکم منکم علیکم | طویل الساعدین له فضول |

یانی: پەیکێك بۆ لای بەنی بەکر رەوانە بکە چونکە هیچ رێگەیەك بۆ لای بەنی کەعب نیە. بڵێ ئەم ستەمە کەسێك لەنێوەی دەکات کەدەستی درێژی هەیە و سەری سەرفەراز.

لەم کاتەدا عەلی ئەم شێعرانەی خوێند:

| | |
|---|---|
| الم تعلم ابا سمعان انا | نرد الشیخ مثلك ذا الصداع |
| و یذهل عقله بالحرب حتی | یقوم فیستجیب لغیر داع |
| فدافع عن خزاعة جمع بکر | و مابك یا سراقة من دفاع |

یانی: ئەی ئەبو سەمعان، ئایا نازانیت ئێمە پیرە پیاوێکی وەك تۆ بەگرفتاری زۆرەوە دەگەڕێنینەوە. لەگۆڕپانی شەڕ ئاوز لەسەریدا نامێنێت بەشێوەیەك هەڵدەستێت و وەڵام دەداتەوە بێ ئەوەی کەس پرسیاری لێ کردبێت. هەمو بەکریەکان پشتیوانی خوزاعەیان کرد بەڵام تۆی، ئەی سوراقە، هیچ بەرگریکارێکت نیە.

وەفدی نوێنەرایەتی خەڵکانی بەسرە، بۆچون و ئەندێشەی کوفیەکانیان وەرگرت و گەڕانەوە. قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەبەسرە گەڕایەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالب دەستی بەوتاردان کرد و سوپاسی خوای کرد. ئاماژەی بە بەدبەختیەکانی رۆژگاری جاهلی وخۆشبەختیەکانی سەرەدەمی ئیسلامدا و نیشانیدا خواوەند بەخشینەکانی خۆی بەم خەڵکە بەخشیوە و ئەوانی بۆ شوێنکەوتنی جێگری پێغەمبەر و دوای ئەو کەسانیتر هاودەست کردوە. دواتر ئەم پێشهاتە رویدا و کەسانێك ئەم گرفتاریەیان دروست کرد کەبەدوای مەبەستەکانی ئەم دنیاوە بون و رژدیان بەکەسانێك برد خوا لەپێشی و پێگەی باشتری پێبەخشیبون و ئاهەنگی ئەوەیان کرد ئیسلام و کاروبارەکانی بشێوێنن بەڵام نەیاندەزانی خوا فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەیەنێت و ئەنجامەکەی ئاسان

دەکات. ئاگادار بن بەیانی بەرێدەکەوم. هیچ کام لەوانەی بەشێوەیەك هاوکاری کوشتنی عوسمانیان کرد، لەگەڵ من کۆچ نەکەن و دەبێت نەزانەکان خۆیان لەمن بێ نیاز بکەن. لەم کاتەدا چەند کەسێك لەمانە کۆبونەوە، لەناویان: عەلبا کوڕی هەیسەم، عودەی کوڕی حاتەم، سالم کوڕی سەعلەبەی قەیسی، شوریەح کوڕی ئەوفی و مالکی ئەشتەر و لەگەڵ چەند کەسێکیتر کە بۆ شەری عوسمان ڕۆشتبون یا بەو کارە رازی ببون. موزێریەکان و عەبدالله کوڕی سەبا و خالید کوڕی مولجەمیش هاتن و راوێژیان کرد و وتیان: چارە چیە؟ ئەمە عەلی و ئەو سوێند بەخوا لەهەر کەسێك زیاتر شارەزایی نوسراوی قورئانە. دەبینن چی دەڵێت. جگە لەمانە (بکوژەکانی عوسمان) و دەستەیەکیتر بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەو ئامادە نەبون. بارودۆخ بەکوێ دەگات ئەگەر ئەو لەگەڵ ئەوان هاودەست بێت و ئەوان لەگەڵ ئەمە سازگاری بگرنەبەر و فراوانی خۆیان و کەمی ئێمە بزانن! ئێوە لەناو دەبەن چونکە لەبەرابەر ئەم خەڵکە زۆر کەمن.

مالکی ئەشتەر وتی: بۆچونی زوبەیر و تەڵحەمان سەبارەت بەخۆمان زانی. بەڵام هێشتا لەبۆچونی عەلی ناگادار نین. خەڵك سەبارەت بەئێمە هاودەستن. ئەگەر ئەوان ئاشتی بکەن لەسەر خوێنی ئێمە دەبێت. با یەکبگرین و دژی عەلی شۆرش بکەین و ئەو بنێرین بۆ لای عوسمان تا ئاژاوەیەکی دیکە دروست ببێت کەتەنیا بەئارام بونەوەی ئەوە رازی دەبن. عەبدالله کوڕی سەبا وتی: ئەندێشەیەکی قێزەونە باست کرد. ئێوە ئەی بکوژەکانی عوسمان، لەزی قار نزیکەی دوهەزار وپێنسەد یا شەشسەد پیاون. کوڕی حەنزەلیە (تەڵحە) و هاورێکانی نزیکەی پێنج هەزار پیاوی شەرکەریان لەگەڵدایە و ئارەزوی کوشتنی ئێوەیان هەیە و هەوڵ دەدەن پێی بگەن. عەلبا کوڕی هەیسەم وتی: با لێرە دور بکەوینەوە و ئەوان بەجێ بێڵین چونکە ئەگەر ژمارەیان کەمتر بێت دەبێتە هۆکاری زیادبونی هێز بۆ دوژمنانیان و ئەگەر ژمارەیان زیاد بکات بۆ ئاشتی کردن لەسەر بنەمای ڕشتنی خوێنی ئێوە پێداگرتردەبن. ئەوان بەجێ بێڵن و بگەڕێنەوە و روبکەنە شارێك لەشارەکان تا کەسێك بێت هێزی لێ وەربگرن و بتوانن لەبەرابەر خەڵك پارێزگاری لەخۆتان بکەن. عەبدالله کوڕی سەبا وتی: ئەم بۆچونەیش ناڕاستە. خەڵك حەز دەکەن ئێوە بەتەنیایی گرفتار بکەن و لەگەڵ

خەڵکانی بێ گوناح نەتانبینن. ئەگەر تەنیا بمێننەوەو خەڵك لەهەر سوچ و قوژبنێك ئێوە دەرفێنن و هەمو شتێك لەئێوە دەستێننەوە. عودەی کوڕی حاتەم وەتی: سوێند بەخوا نەرەزامەندم نەپەشیمان. سەرەسورماوە لەو کەسەی سەبارەت بەکوشتنی عوسمان گومان لای خۆی دروست دەکات و بەزۆربڵەیی رۆژگار بەسەر دەبات. ئەگەر ئەوەی گومانی لێدەکرێت، روبدات و خەڵك بەم پێگەیە بگەن، ئێوە ئەسپ و کەرەستەی جەنگی فراوانتان لەبەردەستایە. ئەگەر هەنگاو بێننە پێش، هێرش دەکەین و ئەگەر دەستدرێژی نەکەنە سەرمان، ئێمەیش دەست درێژی ناکەین. عەبداللە کوڕی سەبا وتی: بۆچونی راست ئەمەیە. سالم کوڕی سەعلەبە وتی: ئەگەر کەسانێتر لەکارەکەی خۆیان جگە لەخوا مەبەستیان ئەم دنیا بوە، من تەنیا مەبەستم خوا بوە، سوێند بەخوا ئەگەر بەیانی روبەرویان ببمەوە، پەشیمان نابمەوە. سوێند بەخوا ئێوە شمشێرتان هاوشێوەی پیاوانێك دەرهێنا کەهیچ کارێکیان رێك ناخرێت مەگەر بەشمشێر. عەبداللە کوڕی سەبا وتی: ئەم دوانەیش بۆ وتن قسەیان هەبو. شورەیح کوڕی ئەوفی وتی: پێش ئەوەی ئێوە دەربکەن، کارەکانتان بەهێز بکەن و ئەو کارەی دواخستنی ناوێت، بەخێرایی ئەنجام بدەن و ئەو کارەی نابێت خێرایی تیا بکرێت، دوا بخەن. ئێمە لای خەڵك لەخراپترین پێگەداین و نازانین چۆن روبەروی یەك ببنەوە، و لەسەر چ بنەمایەك یەکبگرنەوە. عەبداللە کوڕی سەبا وتی: ئەی خەلکینە رێزداری ئێوە لەتێکەڵ بون لەگەڵ خەڵکانە، کاتێك بەیانی خەڵك روبەروی یەك دەبنەوە، ئاگری شەڕ خۆش بکەن و رێگەی بیروراگۆڕینەوەیان پێ مەدەن. ئێوە لەگەڵ هەر کەسێکدابن چارە نیە جگە لەوەی پارێزگاری لەخۆی بکات. دواتر خوا عەلی و زوبەیر و تەڵحە و هەمو ئەوکەسانەی هاورێیەتیان دەکەن، بەشەڕی یەکتر گرفتار دەکات و ئەوان دور دەخاتەوە لەوەی لێی دەترسن. بەڵێ، ئەوان راوێژیان کرد و رێگەی خۆیان دۆزیەوە و لەسەر ئەو پەیمانەی لەسەر رێککەوتن، بڵاوەیان لێکرد و خەڵك نەیانزانی چ مەبەستێکیان لەسەردا پەروەردە کردوە.

بەیانی، عەلی سوار بو و بەرێکەوت و خەڵك لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. ئەو لای خەڵکی عەبدقەیس دابەزی و ئەوان پەیوەستی بون. لەوێ بەرێکەوت و لەزاویە دابەزی و لێرەوە ئاهەنگی بەسرەی کرد. زوبەیر و تەڵحە لەگەڵ عایشە بەرێکەوتن و

لەفەرمزە هاتنەدەر و لەشوێنێك بەناوی (کۆشکی عوبەیدالله کوڕی زیاد) چاویان بەیەك کەوت. کاتێك خەڵك دابەزین، شەقیق کوڕی سوری کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی مەرحومی عەبدی نارد کەکاتێك ڕۆشتیتەدەر، ئێمە ببە بۆ لەشکرگەی عەلی. هەردوك لەگەڵ خەڵکی عەبدقەیس و بەکر کوڕی وایل هاتنەدەر و ڕێگەی خۆیان بەرەو سوپاکەی عەلی سوڕاند. خەڵك وتیان: ئەوانە لەگەڵ هەر کەسێکدا بن، سەرکەوتنیان پێ دەبەخشن. سێ ڕۆژ مانەوە و شەڕ روینەدا. عەلی بەردەوام پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان دەنارد ولەگەڵ ئەوان گفتوگۆی دەکرد و داوای سازان و سازگاری لێدەکردن. هاتنیان لەنیوەی جەمادی الثانی ساڵی ٣٦ /٩ دێسامبەری ٦٥٦ زایینی بو. عەلی پێش هاوەڵانی گەیشت و دابەزی و ئەوان بەردەوام پەیوەستی دەبون. کاتێك دابەزی، ئەبوئەلجەربا بەزوبەیری وت: بۆچونی راست ئەوەیە بەهەزار سوار هێرش بکەیتە سەر عەلی وپێش ئەوەی هاوەڵانی بگەن، لەناوی ببەیت. زوبەیر وتی: ئێمە کاروباری شەڕ باشتر دەزانین بەڵام ئەوان خواوەندەکانی بانگەوازەکەی ئێمەن و ئەمەکارێکە تازە رویداوە وپێش ئەمڕۆ لەئارادا نەبوە. کەسێك دوای ئەم کارە بەبەڵگەیەك راست نەڕواتە لای خوا، بیانوی بۆ رۆژی هەستانەوە نامێنێت. ئێمە چاومان بەوەفدی نوێنەرایەتی ئەوان کەوت و لەسەر پەیمانێك لەیەك جیابوینەوە و هیوادارم بتوانین لەرێگەی ئاشتیەوە کۆتایی بەم گرفتە بێنین. چاوەڕوانی مژدە بن و خۆڕاگر بن. صەبرە کوڕی شەیبان ڕۆشتە لای زوبەیر و تەڵحە و بەوانی وت: لەگەڵ ئێمەدا بۆ شەڕی ئەم پیاوە وەرن چونکە تێفکرین لەجەنگ باشترە لەکۆششی سەرسەختانە. هەردوکیان وتیان: ئەمە کارێکە پێش ئەمڕۆ لەئارادا نەبوە تا لەو بارەوە ئایەیەك دابەزێت یا پێغەمبەر شێوازێکی دیاریکراوی بۆ دابنێت. دەستەیەك لەخەڵك گومان دەکەن نابێت ئەم کارە پەرەپێبدەن، ئەوانە عەلی و هاورێکانی ئەون. ئێمەیش وتمان: شیاو نیە پشت گوێی بخەین یا کارەکەی دوا بخەین. عەلی وتویەتی: بەرەڵا کردنی ئەم خەڵکە خراپە بەڵام لەخراپەی خراپتر باشترە. کاروبارەکان بۆ ئێمە ئاشکرا بوە. فەرمانەکان سەبارەت بەموسوڵمانەکان و لەناو ئەوان بەشێوەیەك گەیشتوە تا سودمەندی گشتگیرتر و لەخۆگری هەموان بێت. کەعب کوڕی سور وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم کەسانە بکوژن. بەهەمان شێوە وەڵامی ئەویان دایەوە. عەلی هەستا و

لەناو خەڵك وتاریدا. ئەعومر كوڕی بەنانی مەنقەری هەستا وسەبارەت بەناهەنگی ئەو بۆ روبەروبونەوە لەگەڵ خەڵكی بەسرە پرسیاری كرد. عەلی وتی: لەسەر بنەمایی ئاشتی و دامركاندنەوەی ئاگری رِق و تۆڵە چاومان پێیان دەكەوێت ئەگەری هەیە خوا لەسەر دەستی ئێمە دوبەرەكی لەناو ئەم ئۆمەتە هەڵبگرێت و قورسایی شەڕ لەسەر شانمان هەڵبگرێت. پرسی: ئەگەر رازی نەبون؟ فەرموی: تا ئەو كاتەی دەست درێژی نەكەنە سەرمان، هێرش ناكەین. وتی: ئەگەر دەست درێژی بكەنە سەرمان؟ وتی: بەرگری لەخۆمان دەكەین.

ئەبوسەلامەی دالانی هەستا و پرسی: ئەگەر ئەم خەڵكە بۆ شەڕ لەرێگە خوا خۆیان ئامادە كردبێت، ئایا بەڵگەیەك بۆ ئەوان بۆ سەندنەوەی ئەم خوێنە دەبینی؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئایا تۆ بەڵگەیەكت هەیە ئەو شەڕە دوابخەیت؟ وتی: بەڵێ، كاتێك ناتوانین لەكارێك تێبگەین، شیاوترین فەرمان سەبارەت بەو كارە ئەوەیە زۆرترین دورئەندێشی تیا بەكار ببرێت و گشتگیرترین و سودمەندترین كاربێت. پرسی: ئەگەر بەیانی گرفتاری شەڕ بوین، رۆژگاری ئێمە و رۆژگاری ئەوان چۆن دەبێت؟ وتی: هیوادارم لەئێمە و ئەوان هیچ پاك و راست كردارێك نەكوژرێت مەگەر ئەوەی خوا بەبەهەشتی شاد بكات.

ئەو لەوتارەكەی خۆی وتی: ئەی خەڵكینە، دەست و زمانتان لەم خەڵكە بەدور بگرن. پێش فەرمانی ئێمە شەڕ دەست پێمەكەن چونكە رۆژی هەستانەوە بەدبەخت و زیانكار ئەو كەسە دەبێت ئەمرۆ بێ بەبەڵگەیەكی ئاشكرا ئاگری شەڕ خۆش بكات. عەلی مالك كوڕی حەبیب و حەكیم كوڕی سەلامەی بۆ لای ئەوان رەوانە كرد و پەیامی دا: ئەگەر لەسەر پەیمانەكەی خۆتان (كە لەگەڵ قەعقاعدا بەستان) ماوەن دەست لەشەڕ هەڵبگرن تا بێین و سەبارەت بەم كارە لێكۆڵینەوە بكەین. ئەحنەف كوڕی قەیس و بەنی سەعد ئامادە بۆ شەڕ رۆشتنە لای ئەو وپارێزگاریان لەحەرقوص كوڕی زوهەیر دەكرد بەڵام خۆیان لەلەشكرەكە بەدور گرت. ئەحنەف كوڕی قەیس دوای كوژرانی عوسمان لەمەدینە بەیعەتی لەگەڵ عەلی كردبو چونكە ئەو بۆ حەج هاتبو دەر و كاتێك دوای حەج گەڕایەوە بۆ مەدینە لەگەڵ عەلی بەیعەتی كرد. ئەحنەف دەڵێت: لەگەڵ عەلی بەیعەتم نەكرد مەگەر ئەوەی زوبەیر و تەڵحە و

عایشەم لەمەدینە بینی (من دەمویست حەج بکەم و خەڵك دەوری عوسمانیان گرتبو) و بەهەرکام لەوانم وت: ئەم پیاوە درەنگ یا زو دەکوژرێت، فەرمان بەمن بدەن لەگەڵ کێ بەیعەت بکەم؟ هەموویان وتیان: لەگەڵ عەلی. پرسیم: ئەو بۆ من پەسەند دەکەن؟ ویتان: بەڵێ. کاتێك حەجم کرد وبۆ مەدینە گەڕامەوە، بینیم عوسمان کوژراوە. لەگەڵ عەلی بەیعەتم کرد و بۆ لای کەسەکانی خۆم گەڕامەوە. لەم کاتەدا لەناکاو هاتوێك هاتە لای من و وتی: عایشە لەگەڵ زوبەیر و تەڵحە لەخەیبەرن وداوای تۆ دەکەن. وتم: چیان دەوێت؟. وتی: لەتۆ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ عەلی لەسەر تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان هاوکاریان دەوێت. بارودۆخێکی دژوار هاتە پێش. بەخۆمم وت: خۆدورخستنەوە لەهاوکاری کردنی دایکی باوەڕداران کارێکی دژوارە. شەڕ کردن لەگەڵ کوڕە مامی پێغەمبەر کەئەوان فەرمانی بەیعەت کردن لەگەڵ ئەویان پێدم، دژوارتر. کاتێك ڕۆشتمە لای ئەم سیانە، وتیان: بۆ فلأنە و فیسارە کار هاتوین. وتم: ئەی دایکی باوەڕداران، ئەی زوبەیر، ئەی تەڵحە، مەگەر لەئێوەم نەپرسی لەگەڵ کێ بەیعەت بکەم و هەموتان وتتان لەگەڵ عەلی! وتیان: بەڵێ. بەلأم عەلی بارودۆخ و شێوازی خەلافەتی گۆڕی. وتم: سوێند بەخوا چونکە دایکی باوەڕداران لەگەڵ ئێوەیە شەڕتان لەگەڵ ناکەم و هەروەها دەست بۆ شەڕ کردن لەگەڵ کوڕە مامی پێغەمبەر درێژ ناکەم چونکە بەیعەتم لەگەڵ کردوە. بەلأم خۆم بەدور دەگرم. فەرمانیان پێدا تا خۆی بەدور بگرێت وئەو لە جەلحا هاورێ لەگەڵ شەش هەزار کەس خۆی بەدور گرت. کاتێك عەلی هاتە بەسرە، ئەحنەف ڕۆشتە لای و وتی: ئەم خەڵکانەی ئێمە گومان دەکەن ئەگەر بەیانی تۆ بەسەر ئەواندا سەرکەویت، پیاوەکانیان دەکوژیت و ژنەکانیان بەئەسیری دەگریت. عەلی وتی: لەکەسێکی وەك من ترسی ئەوەت نەبێت. ئایا دەتوانرێت ئەم کارە لەگەڵ کەسدا بکرێت جگە لەو کەسانەی پشت دەکەنە خوا و ناباوەڕ دەبن؟ مەگەر ئەوان موسوڵمان نین؟ ئەحنەف وتی: بەیەکێك لەم دوپێشنیارە رازی ببە: یا شان بەشانی تۆ شەڕ دەکەم و یا دەهەزار شەڕکەر لەتۆ دوردەخەمەوە. عەلی پرسی: تۆ هاوەلأنت لەشەڕ بەدور گرتوە چۆن دەتوانی هاوکاری من بکەیت؟ ئەحنەف وتی: دەزانم شەڕ لەگەڵ ئەوان شەر لەسەر پەیمانی خواییە. عەلی وتی: ئێستا کەئەمەت وت دەهەزار پیاوی شمشێر وەشێن

لەشەڕی من دوربخەرەوە. ئەو بۆ لای خەڵك گەڕایەوە و داوای لێکرد دانیشن و دواتر وتی: ئەی خەڵکی خەندیف! وەڵامیان دایەوە. دوبارە هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی تەمیم! کەسانێکی زۆر دەوریان گرت. دواتر هاواری کرد: ئەی سەعدیەکان، هیچ خەڵکێکی سەعدی نەمایەوە مەگەر ئەوەی وەڵامی دایەوە. ئەو هەموویانی کۆکردەوە و لەسوچێکدا داینیشاندن و سەیریان کرد تا بزانن خەڵکان چی دەکەن. کاتێك شەڕ رویدا و عەلی سەرکەوت، ئەحنەف و هەمو ئەوکەسانەی خۆیان بەدور گرتبو، هەمان کاریان ئەنجامدا کەخەڵکانی دیکە ئەنجامیان دەدا.

کاتێك دوسوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەست وبۆ شەڕ ئامادە بون، زوبەیر شمشێر لەدەست سوار لەسەر ئەسپێك لەناو سوپاکەی خۆی هاتەدەر. بەعەلیان وت: زوبەیرە. فەرموی: لەنێوان ئەو دوپیاوە ئەو شیاوترینەە ئەگەر خوای بیربێننەوە، خوای بیردەکەوێتەوە.

تەڵحەیش هاتەدەر. عەلی بێ شمشێر و زرێ ڕۆشتە لای ئەم دوانە و ئەوەندە لەوان نزیك کەوتەوە ملی ئەسپەکانیان لەیەك گیر بو. عەلی وتی: بەگیانی خۆم سوێند ئەسپ و پیاوان و کەرەستەی شەڕی فراوانتان کۆکردۆتەوە بەڵام خۆزگە لەبەرابەر خوا بیانو و بەڵگەیەکتان بۆ ئەم کارە دەبو. لەخوا بترسن وەك ئەو ژنە مەبن (دوای تەرخان کردنی هێزی زۆر هەمو چنراوەکانی خۆی کردە خوری) (نحل/١٦/٩٢)مەگەر من برای دینی ئێوە نەبوم؟ مەگەر ئێوەی خوێنی منتان نەدەپاراست و من خوێنی ئێوە؟ ئایا شتێکی تازە رویداوە خوێنی منی بۆ ئێوە رەوا کردوە؟ تەڵحە وتی: خەڵکت دژی عوسمان هاندا. عەلی وتی: ئەمە ئەو رۆژەیە خوا ئایینی راستی و دروستی بەهەمو رۆشنی خۆی، نیشانی ئەوان بدات (نور/٢٤/٢٥) ئەی تەڵحە، تۆ بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان هاتویتەدەر؟ خوا بکوژەکانی عوسمان نفرین بکات! ئەی تەڵحە بوکی پێغەمبەرت گەیاندۆتە ئێرە تا بەهێزی ئەو شەڕ بکەیت و بوکی خۆت لەماڵەوە داشاردوە! ئایا لەگەڵ من بەیعەتت نەکرد؟ تەڵحە وتی: کاتێك بەیعەتم لەگەڵ تۆ کرد شمشێر لەسەر ملم بو. عەلی بەزوبەیری وت: ئەی زوبەیر، چ هۆکارێك تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟ زوبەیر وتی: تۆبویتە هۆکاری ئەوەی من بێمەدەر، چونکە تۆ بۆ ئەم کارە لەخۆمان بەشیاوتر نازانم. عەلی وتی: ئایا دوای عوسمانیش بۆ ئەم کارە

شیاو نیم؟ ئێمە تۆمان بەیەکێك لەکوڕەکانی عەبدولموتەلیب دەزانی تا ئەوەی کوڕەکەت گەورە بو و جیایی لەنێوان ئێمە دروست کرد. عەلی زۆر شتی بیری زوبەیر خستەوە. پێی وت: ئایا ئەو ڕۆژەت بیرە هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەر لای بەنی غەنەم تێپەڕیتی. پێغەمبەر سەیرێکی منی کرد و بزەی گرت و منیش بزەیەکم گرت. تۆ وتت: کوڕی ئەبوتالب دەست لەکردەوە ڕێزدارەکانی خۆی هەڵناگرێت. پێغەمبەر بەتۆی وت: ئەو هیچ کردارێکی ڕێزدارانەی نیە. بێ گومان ڕۆژێك دەگات شەڕ لەگەڵ ئەو دەکەیت و تۆ ستەمکاریت. زوبەیر وتی: ئەی خوایە، بەڵێ، ئەو ڕۆژەم لەبیرە.ئەگەر لەسەرەتاوە لەبیرم بوایە، ئەم ڕێگام نەدەبڕی. سوێند بەخوا هەرگیز لەگەڵ تۆ شەڕ ناکەم. عەلی بۆ لای هاوەڵانی گەڕایەوە و وتی: زوبەیر، پەیمانی لەگەڵ خوا بەست لەگەڵ ئێوە شەڕنەکات. زوبەیر بۆ لای عایشە گەڕایەوە و وتی: لەو کاتەوەی هەستم بەشتەکان دەکرد، هەرکارێکم دەکرد، پێگە و جێگەی خۆم دەزانی جگە لەمڕۆ کەنازانم بۆ بەم کارە هەستاوم. عایشە وتی: ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟ زوبەیر وتی: دەمەوێت وازیان لێ بێنم و بڕۆم. کوڕەکەی عەبدالله پێی وت: دو شەرمی گەورەت دروست کرد و کاتێك دوریز شمشێریان دەرکێشا، بڕیارت دا بڕۆیت و بەجێیان بێڵیت. بەم شێوە نیە بەڵکو تۆ لەئاڵای کوڕی ئەبی تالب ترساویت و زانیت ئەوان گەنجانێکی چالاك و بەهێزیان لەبەردەستایە و مەرگی سوریان لەگەڵدایە، لەبەر ئەمە خۆت دورخستەوە. ئەم قسەیە زوبەیری توڕە کرد. وتی: سوێندم خواردوە لەگەڵ ئەو شەڕ نەکەم. عەبدالله وتی: تاوانی شکاندنی سوێندەکەت بدە و شەڕی لەگەڵ بکە. زوبەیر کۆیلەکەی خۆی مەکحولی ئازاد کرد. دەستەیەك دەڵێن: ناوی کۆیلەکەی سەرجس بو. عەبدئەلرەحمان کوڕی سلێمانی تەمیمی وتی:

لم ار کالیوم اخا اخوان          اعجب من مکفر الایمان

یانی: کارێکی سەرسوڕهێنەرتر لەکاری ئەمڕۆم نەبینیوە کەئەو پیاوە گەورە سوێندەکەی خۆی شکاند و تاوانەکەی دا.

ئەم قەسیدەیە چەندین دێڕی هەیە.

دەستەیەك دەڵێن: زوبەیر لەبەر ئەوە دەستی لەشەڕ هەڵگرت چونکە زانی عەمار کوڕی یاسر لەگەڵ عەلیە. ترسا عەمار بکوژێت چونکە پێغەمبەر وتبوی: ئەی عەمار

تۆ بەدەست ستەمکاران دەکوژرێیت. بەڵام بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا، کوڕەکەی عەبدالله ئەوی گەڕاندەوە. خەڵکی بەسرە بون بەسێ دەستە: دەستەیەك لەگەڵ زوبەیر و تەڵحە، دەستەیەك لەگەڵ عەلی و دەستەیەك کەشەڕیان بەرەوا نەدەزانی. لەناو ئەوان ئەحنەف کوڕی قەیس و عیمران حەصین و کەسانی دیکە بون. عایشە هات و لەمزگەوتی حودان لەناو خەڵکی ئەزد دابەزی. لەم کاتەدا سەرکردەی ئەزدیەکان صەبرە کوڕی شیمان بو. کەعب کوڕی سور پێی وت: کاتێك دوسوپایی بەم گەورەییە روبەروی یەك ریز ببەستن، کەس ناتوانێت لەشەڕ رێگری بکات. ئەوان هاوشێوەی دەریایەکی خرۆشاون. گوێ لەفەرمانی من بگرە و لەم کارەدا بەشداری مەکە و خۆت و خەڵکەکەت دورەپەرێز بگرە چونکە دەترسم ئاشتی لەئارادا نەبێت. میوزەریەکان و خەڵکی رەبیعە کەبرای یەکەن بەخۆیان بسپێرە، ئەگەر ئاشتیان کرد، ئەو کارەیە ئێمە خوازیارین پێی و ئەگەر کوشتاری یەکیان کرد، بەیانی فەرمانڕەوای ئەوان دەبین.

کەعب لەرۆژگاری جاهلی لەسەر ئایینی مەسیحی بو. لەبەر ئەمە صەبرە پێی وت: دەترسم رگێکی مەسیحی لەتۆدا مابێت! ئایا فەرمان بەمن دەدەیت لەچاکسازی و سەقامگیر کردنی ئاشتی لەناو خەڵکان خۆم بەدور بگرم و دایکی باوەڕداران و زوبەیر و تەڵحە بەتەنیا بەجێ بێڵم و خوێنی عوسمان لەبیر بکەم! سوێند بەخوا هیچ کات ئەم کارە ناکەم. لەبەر ئەمە هەمو یەمانیەکان ئاهەنگی ئامادەبونیان کرد. لەهۆزەکانی عەرەب ئەمانە هاتنە لای عایشە: منجاب کوڕی راشد لەگەڵ خەڵکی رێباب یانی: تیم و عودەی و سور و عوکەل مناڵەکانی عەبد مەناف کوڕی ئەد کوڕی تابخە کوڕی ئەلیاس کوڕی موزەر، زەببە کوڕی ئەد کوڕی تابخە، ئەبولجەربا هاورێ لەگەڵ عەمرۆ کوڕی تەمیم، هیلال کوڕی وەکیع هاورێ لەگەڵ بەنی حەنزەلە، صەبرە کوڕی شەیبان هاورێ لەگەڵ ئەزدیەکان، موجاشع کوڕی مەسعودی سەلەمی هاورێ لەگەڵ سولەیم، زوفەر کوڕی حەرەس لەگەڵ بەنی عامر و غەتەفان، مالك کوڕی مەسمەع لەگەڵ بەکریەکان، خرییت کوڕی راشد لەگەڵ بەنی ناجیە، یەمانیەکان بەسەرکردایەتی زونەلجرەی حێمەیری.

کاتێك زوبەیر و تەڵحە هاتنەدەر، موزەریەکان لەتەنیشت ئەوان جێگەیان گرت و

دڵنیا بون ئاشتی سەقامگیر دەبێت، خەڵکی رەبیعە لەخواروی ئەوان دابەزین و لەئاشتی دڵنیا بون و یەمانیەکان لەخوار ئەوان دابەزین و گومانیان لەسەقامگیر بونی ئاشتی نەدەکرد. عایشە لەحودان بو و خەڵك لەزابوقە لای سەرکردەکانیان. ژمارەی ئەوان دەگەیشتە سی هەزار پیاوی شەڕکەر. مالك و حەکیمیان بۆ لای عەلی گەڕانەوە و وتیان ئێمە لەسەر پەیمانەکەی خۆمان سورین. عەلی لەبەرابەر ئەوان دابەزی و هەر هۆزێك لەبەرابەر هاوتاکەی خۆی. رەبیعە لەبەرابەر رەبیعە، یەمانیەکان لەبەرابەر یەمانیەکان، موزەریەکان لەبەرابەر موزەریەکان. خەڵك لەیەك نزیك بونەوە و تەنیا باسی ئاشتیان دەکرد. هاورێکانی عەلی بیست هەزار پیاوی شەڕکەر بون. عەلی و زوبەیر و تەڵحە هاتنەدەر و رێککەوتن و کارێکیان جگە لەئاشتی و پشت گوێخستنی شەڕ و دوژمنایەتی پەسەند نەکرد. لەسەر ئەم پەیمانە لەیەك جیابونەوە. عەلی شەوانە عەبدالله کوڕی عەباسی بۆ لای زوبەیر و تەڵحە رەوانە کرد و ئەو دوانە محەممەد کوڕی ئەبی تەڵحەیان بۆ لای عەلی رەوانە کرد. عەلی پەیك و پەیامی بۆ لای هاوەڵانی خۆی نارد و زوبەیر و تەڵحەیش سەرکردەکانی سوپاکەیان ئاگادار کردەوە. خەڵك شەوێکی ئارام و ئاسودەیان بەسەر برد و هاوشێوەیان نەبینیبو چونکە لەدەوری باخی ئاشتی کۆببونەوە. ئەوانەی دژی عوسمان شۆڕشیان کردبو، بەمشێوەیە شەویان بەسەر برد وبەردەوام لەژاکان و لەناوچون نزیك دەبونەوە. شەوانە کۆبونەوە و راوێژیان کرد. لەسەر ئەوە رێککەوتن ئاگری شەڕ خۆش بکەن. لەتاریکی شەو هاتنەدەر و کەس نەیدەزانی چ مەبەستێکیان هەیە. لەدڵی تاریکی ئارام ئارام خزان. موزەریەکان ئاهەنگی موزەریەکانی خۆیان کرد، رەبیعیەکان ئاهەنگی رەبیعیەکان و یەمانیەکان ئاهەنگی یەمانیەکانی خۆیان کرد. ئەوان شمشێریان خستە ناویان و خەڵکانی بەسرە خرۆشان و هەر کەس ئاهەنگی خەڵکەکەی بەرابەر خۆیان کرد کەهێرشیان کردبو سەریان. زوبەیر و تەڵحە عەبدولرەحمان کوڕی حەرەسیان وەك فەرماندەی باڵی راست دەستنیشان کرد کەخەڵکانی رەبیعە بون و عەبدولرەحمان کوڕی عەتابیان کردە فەرماندەی باڵی چەپ. ئەو دوانە لەدڵی سوپادا مانەوە. وتیان: ئەمە چیە؟ وتیان: خەڵکانی کوفە شەوانە هێرشیان کردۆتە سەرمان. ئەو دوانە وتیان: دەمانزانی عەلی دەست هەڵناگرێت تا خوێن نەرێژێت. ئەو بەئاشتی لەگەڵ

ئێمە ناسازێت. لەبەر ئەمە خەڵکانی بەسرە نێوەنجیگەرانی ئاشتیان بۆ ناو لەشکرەکەیان گەڕاندەوە.

عەلی و خەڵکانی کوفە دەنگی هاواریان بیست. سەبئیەکان هەواڵنێرێکی نهێنیان لای عەلی دانابو تا ئەوان لەهەواڵی کارەکانی ئەوان ئاگادار بکاتەوە. کاتێك عەلی وتی: ئەمە چیە؟ ئەو پیاوە وتی: هێشتا نەکەوتبوینە خۆمان، بینیمان شەڕکەرانێك لەخەڵکی بەسرە هێرشیان کردە سەرمان. پاشەکشێمان بەوان کرد و بینیمان بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کردوە. عەلی فەرماندەی باڵی چەپی بۆ لای چەپ رەوانە کرد و فەرماندەی باڵی راستی بۆ لای راست. عەلی وتی: دەمزانی زوبەیر و تەڵحە دەست هەڵناگرن تا خوێن برێژن، ئەم دوانە بەئاشتی لەگەڵ ئێمەدا ناسازێن. لەمناوەدا سەبەئیەکان بۆ هەرچی زیاتر گەورە کردنی شەڕ هەوڵیان دەدا. عەلی لەناو خەڵك هاواری کرد: دەست هەڵگرن چونکە پێشهاتێك روینەداوە. بۆچونی هەموان لەو ئاژاوەدا ئەوە بو شەڕ دەست پێنەکەن تابەرابەر ئەو کارە بکات. هەر دولا دەیانویست بەڵگەیەك لای خوا بۆ ئەویتر نەهێڵێتەوە. دەیانویست هەڵاتوان نەکوژن، زیان لەبریندارەکان نەدەن، جل وبەرگ یا شتیتر نەڕفێنن، شمشێر لەسەر خەڵکانی بەسرە نەکێشن و کاڵاکانی یەکتر تاڵان نەکەن. کەعب کوڕی سوار بەرێکەوت و ڕۆیشتە لای عایشە و وتی: فریای خەڵکان بکەوە چونکە هاوەڵانی عەلی تەنیا شەڕیان دەوێت ئەگەری هەیە خوا بەبونی تۆ ئاشتی سەقامگیر بکات.

ژن سوار بو و ئەوان کەژاوەکەیان زرێپۆش کرد. کاتێك سوار لەسەر وشترەکەی لەماڵەکان هاتەدەر وگەیشتە شوێنێك دەنگی پیاوان و بەرکەوتنی شمشێرەکانی دەبیست، لەشوێنەکەی خۆی وەستا و خەڵك شەڕیان دەست پێکرد. زوبەیر شەڕی دەست پێکرد و عەمار کوڕی یاسر هێرشی کردە سەر. عەمار بەردەوام ڕمی بەدەوری ئەودا دەسوڕاند و زوبەیر هیچ کارێکی نەدەکرد و دەیوت: ئەی ئەبو یەقزان ئاهەنگی کوشتنی منت هەیە؟ عەمار وتی: نە ئەی ئەبو عەبداللە . زوبەیر لەبەر ئەمە دەستی بۆ ئەو نەدەبرد چونکە پێغەمبەر وتبوی: عەمار لەلایەن دەستەیەکی ستەمکارەوە دەکوژرێت. ئەگەر ئەم وتەیە نەدەبو، ئەوی دەکوشت. لەم کاتەدا کەعایشە وەستابو، هاوارێکی بیست. پرسی: ئەمە چیە؟ وتیان: هاواری سوپاییەکان. پرسی: بەخراپە یا

بەباشە؟ وتیان: بەخراپە. لەمەدوا بەردەوام هەواڵی شکان بەودەگەیشت. زوبەیر لەوێوە ناهەنگی دۆڵی وەحشیەکانی کرد. لەبەر ئەوە گۆڕەپانی شەڕی بەجێهێشت چونکە ویستبوی سوێندەکەی خۆی لەگەڵ عەلی بۆ شەڕ نەکردن بشکێنێت و کەمێك لەئازایەتی و پیاوەتی خۆی نیشان بدات و دواتر بۆ هەمیشە بەرێگایی خۆیدا بڕوات.

بەلاَم تەڵحە، تیرێك لەتیرهاوێژێك نەزانراو بەریکەوت و کوشتی. تیر، قاچی ئەوی بەکەلەکەی ئەسپەکەیەوە دوری وئەو بەردەوام هاواری دەکرد: وەرنە لای من، وەرنە لای من ئەی بەندەکانی خوا! تێبکۆشن، تێبکۆشن تا جل وبەرگی شەرم نەپۆشن. قەعقاع کوڕی عەمرۆ وتی: ئەی باوکی محەممەد، تۆ بریندار بویت و لەمەبەستەکەی خۆت دورکەوتویتەوە. بڕۆ بۆ ناو ماڵەکان. ئەو ڕۆشت و خوێنی لێدەباری و دەیوت: ئەی خوایە ئەوەندە تۆڵەی عوسمان لەمن بستێنە تا رازی بی. کاتێك پێلاَوەکانی پڕ بو لەخوێن و قورس بو، بەکۆیلەکەی خۆی وت: من لای خۆت سوارکە و بگەرە شوێنێك بتوانین دابەزین. ئەو ڕۆشتە ناو بەسرە و لەناو وێرانەیەك بەجێی هێشت و تەڵحە لەوێ مرد. دەستەیەك دەڵێن: یەکێك لەپیاوەکانی عەلی لای ئەو تێپەڕی کرد. تەڵحەی وتی: تۆ لەهاوەلاَنی عەلیت؟ وتی: بەڵێ. تەڵحە وتی: دەستت بێنە تا بەیعەت لەگەڵ تۆ بکەم. لەگەڵ ئەو بەیعەتی کرد چونکە دەترسا بمرێت و بەیعەتی لەئەستۆدا نەبێت. کاتێك مرد، ئەویان لەناو بەنی سەعد بەخاك سپارد. تەڵحە دەیوت: پیرێکی هاوشێوەی خۆمم نەدیوە بەمشێوەیە بەئاسانی خوێنی بەفیڕۆچوبێت. چارەنوسی خۆی و زوبەیر لەم هۆنراوانەدا بیر دەخاتەوە:

فان تکن الحوادث اقصد تنی — و اخطتاهن سهمی حین ارمی

فقد ضیعت حین تبعت سهما — سفاها ما سفهت و ضل حلمی

ندمت ندامة الکسعی لما — شریت رضا بنی سهم برغمی

اطعتهم بفرقة آل لای — فالقوا للسباع دمی و لحمی

یانی: ئەگەر ڕوداوەکان ناهەنگی منیان کرد و تیری من لەکاتی هاویشتن بەرەو ئەوان خزا و لەنیشانەکەی دور کەوتەوە، من لەبەر ئەوە لەناوچوم ڕوبەڕوی نیشانەی تیری نەزانەکان بەرەو پێش ڕۆیشتم نەك ئەوەی خۆم نەزان بوبێتم یا ئاوزم لەدەست دابێت. وەك کەسعی پەشیمان بومەوە و ئەمە لەکاتێکدا بو ڕەزامەندی بەنی سەهمم

بەبەهای نارەزامەندی خۆم کرپەوە. لەوان لەسەر بنەمای جیابونەوە لەبنەماڵەی (لای) لایەنگیریم کرد و ئەوان خوێن وگۆشتی منیان خستە بەردەم وەحشیەکان.

ئەو کەسەی تیری بۆ تەڵحە هاویشت، مەروان کوڕی حەکەم یا کەسێکیتر بو. زوبەیر لای سوپاکەی ئەحنەف کوڕی قەیس تێپەڕی. ئەحنەف وتی: سوێند بەخوا ئەم کارەی لەجێگەی خۆیدا نیە، موسوڵمانانی روبەروی یەك کردەوە و کاتێك شمشێریان لەیەك دەرکێشا، خۆی کشایەوە و بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە. ئەحنەف بەخەڵکەکەی خۆی وت: چ کەسێك هەواڵی ئەو پیاوە بۆ من دێنێت. عەمرۆ کوڕی جەموز بەهاوەڵانی خۆی وت. من هەواڵی ئەو دێنم. ئەو بەدوای زوبەیر بەرێکەوت. کاتێك پێی گەیشت، زوبەیر پرسی: چی لەپشتی سەرتە؟ عەمرۆ کوڕی جەرموز وتی: هاتوم شتێك لەتۆبپرسم. کۆیلەی زوبەیر بەناوی عەتیە وتی: ئەو دوژمنە. زوبەیر وتی: ئەمە پیاوە هیچ و پوچە چ ترسێك دەتوانێت لەدڵی تۆدا دروست بکات. کاتی نوێژ گەیشت. کوڕی جەرموز ڕۆشتە پشت سەری و بەرم لەیەخەی زرێکەیدا و کوشتی و ئەسپ و کەل و پەلەکانی شەڕ و ئەنگوستیلەکەی هەڵگرت و کۆیلەکەی ئازاد کرد. کۆیلە ئەوی لەدۆڵی وەحشیەکان بەخاك سپارد و کوڕی جەرموز بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە و ئاگاداری کردنەوە. ئەحنەف کوڕی قەیس وتی: سوێند بەخوا نازانم کارێکی باشت کردوە یا خراپ.

کوڕی جەرموز هاتە لای عەلی و بەدرگاوانەکەی وت: بۆ بکوژەکەی زوبەیر داوای مۆڵەت بکە. عەلی وتی: مۆڵەتی بدە و مژدەی ئاگری جەهەننەمی پێ ببەخشە! ئەو شمشێرەکەی زوبەیری بۆ عەلی هێنا. عەلی وەریگرت و سەیری کرد و وتی: شمشێرێکە رۆژگارێکی درێژ خەمی لەروخساری پێغەمبەر پاك دەکردەوە. کاتێك شەڕ تەواو بو و خەڵکانی بەسرە رویان لەشارەکە کرد، عەلی شمشێرەکەی بۆ لای عایشە رەوانە کرد. بەڵێ، کاتێك سوپای دوژمن بینی، سوارەکان دەوری وشترەکەیان گرتوە، یەك دڵ و یەك دەست، بەهەمان شێوەی سەرەتا گەڕانەوە و کۆبونەوە. خەڵکی رەبیعە لەبەسرە دەستەیەکیان لای راست وەستان و دەستەیەکیان لای چەپ. کاتێك بای گۆڕەپان دامرکایەوە و خەڵك شکەستیان خوارد، عایشە بەکەعب کوڕی سوری وت: وشترەکە بەربدە و بەقورئانەوە بەرەو ئەو سوپایە برۆ و داوا لەخەڵك بکە قورئان

بکەنە داوەری خۆیان. ئەو روی کردە سوپاکەی عەلی و سەبەئیەکان لەپێشیانەوە بون. سەبەئیەکان هاوشێوەی یەك کەس تیربارانیان کرد و کوشتیان و دایکی باوەڕدارانیان لەناو کەژاوەکەی تیرباران کرد. ژن بەردەوام هاواری دەکرد: بەجێماوەکان، فریایی بەجێماوەکان بکەون، کوڕەکانی من! هاواری بەرزی ئەو دەنگی دایەوە کەدەیوت: خوا، خوا بیربێننەوە و رۆژی هەستانەوە! ئەوان تەنیا پێشڕەویان دەکرد. کاتێك ئەمان بەپێشنیارەکەی رازی نەبون، یەکەم کار کردی ئەوە بو، وتی: ئەی خەڵکینە بکوژەکانی عوسمان نفرین بکەن و لەخوا بۆ لەناو بردنیان بپاڕێنەوە. ئەو دەستی بەپاڕانەوە کرد و خەڵك بەردەوام دەپاڕانەوە. عەلی دەنگی ئەوی بیست و پرسی: ئەوە چیە؟ عایشەیە، نفرین لەبکوژەکانی عوسمان و شوێنکەوتەکانیان دەکات. عەلی وتی: خوا بکوژەکانی عوسمان نفرین بکات. عایشە کەسی بۆ لای عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب و عەبدولرەحمان کوڕی حەرەس نارد تا لەشوێنەکانی خۆیان خۆڕاگری بکەن. کاتێك بینی خەڵك ئاهەنگی ئەویان کردوە و دەست لەشەڕ هەڵناگرن، سوپاکەی خۆی بۆ شەڕ هاندا. موزەریەکان بەسرە هێرشیان کردە سەر موزەریەکانی کوفە و ئەوانیان کوشتار کرد بەرادەیەك عەلی کەوتە تەنگانەوە. ئەو دەستێکی خستەسەر پشتە ملی کوڕەکەی یانی محەممەد کوڕی حەنیفە کەئاڵای سوپاکەی لەدەستابو، پێی وت: پێشڕەوی بکە. ئەوەندە پێشڕەوی کرد کەشوێنێکی بۆ پێشڕەوی جگە لەبەرابەر ڕمە بەرزبوەکان نەبینی. عەلی ئاڵاکەی لێوەرگرت و وتی: کوڕم لەگەڵ مندا هێرش بەرە.

موزەریەکانی کوفە چالاکیان لەخۆیان نیشاندا و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی پێش ئەشتەر تائەوەندەی کەوتنە جموجۆڵ و خرۆشان. باڵەکانی چەپ و راست بەهەمان شێوە لەشوێنەکانی خۆیان بون و هیچیان نەدەکرد. کەسانی وەك زەید کوڕی صوحان جگە لەموزەریەکان هاورێیەتی عەلیان دەکرد. داوایان لێکردبو بۆ ئەم پانتاییە بێت. خەڵك پێیان وت: بۆ لای خەڵکەکەی خۆت بگەڕێرەوە، تۆ کارت بەم شوێنە چیە؟ ئایا نازانیت موزەریەکان روبەروی تۆن و ئەشتەر لەپێش تۆیە و هەرکەس لەو نزیك ببێتەوە، تامی مەرگ دەچێژێت؟

زەید وتی: مەرگ باشترە لەم ژیانە. من خوازیاری مەرگم. ئەو براکەی سیحان کوڕی صوحان کوژران و براکەیان صەعصەعە کوڕی صوحان بەنیوەی گیانی لەگۆڕەپانی

شەڕ دوریان خستەوە و شەڕ روی لەدژوار بون کرد. کاتێك عەلی ئەمەی بینی، کەسی بۆ لای یەمانیەکان و خەڵکانی رەبیعە نارد و فەرمانی پێدان پیاوەکانی خۆیان کۆبکەنەوە و هێرش دەست پێبکەن. پیاوێك لەعەبدئەلقەیس لەهاوەڵانی عەلی وتی: ئێوە بۆ نوسراوی خوایی بانگ دەکەین. وتیان: چۆن کەسێك بۆ نوسراوی خوایی بانگمان دەکات کە لەسەر باوەڕەکەی سور نیە و سزا خواییەکان بەکار نابات و کەعب کوڕی سور دەکوژێت! خەڵکی رەبیعە هاوشێوەیە یەك کەس ئەو پیاوەیان تیرباران کرد و کوشتیان. موسلیم کوڕی عەبداللە عێجلی هەستا و جێگەی گرتەوە و قورئان بەدەست داوای لەهاوەڵانی عایشە کرد نوسراوی خوا بکەنە داوەر. ئەویشیان تیرباران کرد و کوشتیان. یەمانیەکانی کوفە قورئانیان بردە پێش و داوایان لەیەمەنیەکانی بەسرە کرد قورئان بکەنە داوەر، بەڵام ئەوانیشیان تیرباران کرد. کوفیەکان شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد و ناهەنگی سەرچاوە (وشتر و وشترسوارەکەیان) کرد. عایشە هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە، هاواریان بەرز بویەوە و ریزیان بەست و گەڕانەوە و شەڕیان کرد. یەمەنیەکانی بەسرە هێرشیان کردە سەر یەمەنیەکانی کوفە و ئەوانیان تێکشکاند و رەبیعیەکانی بەسرە شەڕیان لەگەڵ رەبیعیەکانی کوفە دەست پێکرد وئەوانیان تێکشکاند. دواتر یەمەنیەکانی کوفە گەڕانەوە و لەژێر ئاڵاکەیان دەکەس کوژران: پێنج کەس لەهەمەدان و پێنج کەس لەیەمەنیەکان. کاتێك یەزید کوڕی قەیس ئەمەی بینی، ئاڵاکەی گرتە دەست و بەبەهێزی لەدەستیدا مایەوە و وتی:

قد عشت یا نفسی و قد عشیت　　　　دهرا فقدك الیوم ما بقیت

اطلب طول العمر ماحییت

یانی: ئەی گیانی من، ژیانت درێژ کردەوە و من رۆژگارێکی درێژە زیندوم، ئەمڕۆ بۆ هەمیشە بۆ تۆ بەسە. تا ئەو کاتەی هەم، ئارەزوی درێژبونی ژیان دەکەم.

ئەمە هۆنراوەی خۆی نەبو، بەڵکو هاوشێوەی داستان ئاماژەی پێدا.

کوڕی ئەبی ئەمرانی هەمەدانی وتی:

جردت سیفی فی رجال الازد　　　　اضرب فی کهولهم المرد

کل طویل الساعدین نهد

یانی: شمشێرەکەم لەبەرابەر پیاوەکانی ئەزد لەکالآن دەرهێنا، بەردەوام

لەپیرەکانیانم دەدا و گەنجەکانیان، هەمویان شەڕکەری بالأبەرز و بازوی ئەستوریان هەیە.

ڕەبیعیەکانی کوفە گەڕانەوە و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد وئەم کەسانە لەژێر ئاڵاکەیاندا کوژران: زەید کوڕی صوحان، عەبدالله کوڕی ڕەقەبە و ئەبوعوبەیدە کوڕی ڕاشدی سەلەمی کە لەکاتی گیاندان بەردەوام دەیوت: خوایە، تۆ بویت ئێمەت لەگومڕاییەوە خستە سەر ڕێگای ڕاست و لەنەزانی ڕزگارت کردین و لەئاژاوەدا تاقیت کردینەوە بەشێوەیەك لەگەڵ کارە هاوشێوەکان و گوماندارەکان بەسەرمان دەبرد. ئەو کوژرا. کارەکە ڕوی لەدژواری کرد بەشێوەیەك باڵی ڕاستی کوفیەکان پەیوەستی دڵی سوپاکەیان بو و باڵی چەپی خەڵکانی بەسرە پەیوەستی دڵی سوپاکەیان. ئەوان ڕێگریان کرد لەپەیوەست بونی شەڕکەرانی باڵی ڕاستی کوفیەکان کە لەکەنارییاندا بون. شەڕکەرانی باڵی چەپی کوفیەکانیش ئەم کارەیان لەگەڵ شەڕکەرانی باڵی ڕاستی خەڵکانی بەسرە کرد. کاتێك سوپاسالارەکانی موزەر لەخەڵکانی بەسرە و کوفە، بینیان هەردو لای شەڕکەر خۆڕاگری دەکەن، هاواریان کرد: لە هەر شوێنێك شەڕ گەیشتە کەنارەکان، ئاهەنگی کەنارەکان (دەست و قاچەکان) بکەن. پێش ئەم شەڕ و دوای ئەوەیش هیچ کات کارێکی ناخۆشتر لەمە پێش نەهات و نەبینرا ئەم هەمو دەست و پێیە لەجەستەکان جیا ببنەوە. دەستی عەبدولڕەحمان کوڕی عەتابیش پێش کوژران لەجەستەی جیابویەوە. عایشە سەیری باڵی چەپی خۆی کرد و وتی: شەڕکەرانی باڵی چەپی من کێن؟ صەبرە کوڕی شیمان وتی: ئەزدیەکان. عایشە وتی: ئەی بنەماڵەی غەسان، ئەو ئازایەتی و بوێری و پیاوەتی و چالاکیەتان بپارێزن کەبەردەوام دەمانبیست. ئەو ئەم هۆنراوەی هاوشێوەی پەخشانێك ئاماژە پێدا:

و جالد من غسان اهل حفاظها       و هنب و اوس جالدت و شبیب

یانی: لە غەسانیەکان، خەڵکانی شەڕکەر و بەئەزمونی ئەوان چالاکیان نواند بەهەمان شێوەی خەڵکانی هێنب وئەوس و شەبیب.

خەڵکانی ئەزد پشکڵی وشتری عایشەیان هەڵدەگرتەوە و بۆنیان دەکرد، ماچیان دەکرد و دەیانوت: پشکڵی وشتری دایکمان خۆشترین بۆنی هەیە! سەیری باڵی ڕاستی خۆی کرد و پرسی: شەڕکەرانی باڵی ڕاستی ئێمە کێن؟ وتیان: خەڵکی بەکر کوڕی

وایل. ژن وتی: ئەم هۆنراوەیان بۆ ئێوە هۆنیوەتەوە:

و جاؤوا الینا فی الحدید کانهم          من العزة القصعاء بکر بن وائل

یانی: ناسن پۆشیو هاتنە لای ئێمە وەك بڵێی لەرێزداری و بەهێزی، پیاوەکانی بەکر کوڕی وایل بون. لەبەرابەر ئێوە پیاوەکانی عەبدقەیسن.

ئەوان زیاتر لەجاران هەوڵیاندا و تێکۆشان.

ئەوهاواری لەدەستەیەکی شەڕکەری پێش خۆی کرد و پرسی: ئەم پیاوانە کێن؟ وتیان: بەنی ناجیە. عایشە وتی: دەستخۆش، دەستخۆش بۆ شمشێرەکانی ئەبتەحی قوڕەشی! ئەوان ئەوەندە سەرسەختانە تێکۆشان بونە هۆکاری ترسی هاوەڵانی عەلی. دواتر بەنی زەببە لەدەوری کۆبونەوە و ئەو هاواری کرد: ئای ئاگرەکان، ئای ئاگرەکان! کاتێك ئەمان رویان لەلاوازی کرد، بەنی عودەی کوڕی عەبد مەنات ڕۆشتنە ناو ئەوان وکەسانی زۆر لەدەوری ئەو ژنە کۆبونەوە. عایشە پرسی: ئێوە کێن؟ وتیان: بەنی عودەین و براکانمان تیکەڵمان بون. ئەوان دەوری وشترەکەیان بەبەهێزی پاراست و پیاوانە شەڕیان کرد و لەبڕین و شکاندن و فرتاندن کەمتەرخەمیان نەکرد. کاتێك ئەم کارەی زیادی کرد و نیشانەکانی لەناو هەردو سوپاکە دەرکەوت، ئاهەنگی وشترەکەیان کرد و وتیان: ئەوانە بەردەوام خۆڕاگری دەکەن تا ئەو کاتەی وشترەکە لەسەر پێ بێت. هەردوباڵی چەپ و راستی سوپاکەی عەلی پەیوەستی دڵی سوپاکەی بون و خەڵکانی بەسرەیش ئەو کارەیان کرد و پیاوان ڕقی یەکیان لەدڵ گرت. عێمەیرە کوڕی یەسربی کەداوەری بەسرە پێش کەعب کوڕی سور بو، سەری وشترەکەی گرت. ئەو و براکەی عەبداللە کوڕی یەسربی لای وشترەکە شەڕیان کرد. عەلی وتی: کێ هێرش دەکاتە سەر وشترەکە؟ هند کوڕی عمرۆ جەمەلی ئامادەیی نیشاندا. کوڕی یەسربی ڕێگەی لێگرت و ئەم دوانە، دو جار لەیەکیاندا و کوڕی یەسربی ئەوی کوشت. دوای ئەو عەلبا کوڕی هەیسەم رۆشتە پێش و کوڕی یەسربی ئەویشی کوشت. سیحان کوڕی صوحان کوژرا و صەعصەعە کوڕی صوحانیان نیوەگیان لەگۆڕەپانی شەڕ بردە دەر. کوڕی یەسربی وتی:

انا لمن ینکرنی ابن یثربی          قاتل علباء و هند الجملی

و ابن لصوحان علی دین علی

یانی: هەر کەس من ناناسێت بزانێت کوڕی یەسربیم، بکوژی عەلیا و هندی جەمەلی و یەکێك لەکوڕەکانی صوحان کە لەسەر ئایینی عەلی بو.

هەوەها کوڕی یەسربی وتی:

اضربهم ولا ارى ابا الحسن        كفى بهذا خزنا من الحزن

انا نمر الامر امرار الرسن

یانی: بەردەوام لەوان دەدەم و باوکی حەسەن نابینم. لەناو خەمەکان ئەمە بەسە. ئێمە ڕمەکان هاوشێوەی تەناف گوزەر دەدەین.

عەمار کوڕی یاسر هاواری لێکرد: لەقەلأیەکی بەهێزدایت و ڕێگەیەك بۆ لای تۆ نیە. ئەگەر ڕاست دەکەیت لەناو ئەو دەستە شەڕکەرە وەرەدەر و شەڕی من بکە. ئەوجلەوی لەدەست پیاوێك لەبەنی عودەی بەجێهێشت و کاتێك گەیشتە نێوان دوریزی سوپاکە، عەمار روبەروی بویەوە. عەمار نەوەد ساڵ زیاتری بو. پێستەیەکی لەبەردابو کەناوەکەی بەڕشتەیەك لەخوری بەستبو. ئەو لەبەرابەرەکەی ناتەوانتر بو. خەڵك بانگەوازی دوای مەرگیان بۆ ئەم پیاوە هێنایە سەر لێو و وتیان: ئەم پیرەپیاوەیش پەیوەستی هاوەڵانی بێت. کوڕی یەسربی شمشێری هێنایە خوار و عەمار قەڵغانەکەی خستەبەر، شمشێر لەقەڵغانەکە چەقی و زۆری هەوڵدا دەریبێنێت بەڵام نەیتوانی. عەمار چاوی بریە هەردوقاچی و و هەردوکیانی قرتاند. پیاو بەقنەوە کەوتە سەرزەوی، ئەویان گرت و بردیانە لای عەلی. بەعەلی وتی: مەمکوژە! عەلی وتی: دوای ئەوەی سێ پیاوی پاکت کوشت! فەرمانیدا و سەریان بڕی. دەستەیەك دەڵێن: کوژراو عەمرۆ کوڕی یەسربی بو و عێمەیرە کوڕی یەسربی بەزیندویی مایەوە و لەرۆژگاری معاویە بو بەسەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە. کاتێك کوڕی یەسربی کوژرا، ئەو پیاوە عەدەویە جڵەوەکەی بەکەسێك لەبەنی عودەی سپارد وبۆ شەڕ هاتەدەر. ڕەبیعە عەقیلی روبەروی بویەوە و بەمشێوەیە سرودی شەڕی هێنایە سەر زمان:

یا امنا اعق ام نعلم        و الام تغذو ولدا و ترحم

الاترین کم شجاع یکلم        و تختلی منه ید و معصم

یانی: ئەی دایکی ئێمە، ئەی بێ بەزەییترین دایکێك کەدەیناسین. دایك خواردن

بەمناڵەکانی دەدات و خۆشەویستیان پێ دەدات. ئایا نابینیت چەندە پیاوی بوێر بریندار و دەکوژرێن! نابینی ئەو هەمو دەست و قاچە دەقرتێن.

هێرشیان کردە سەریەك و یەکێتریان بریندار کرد و هەردوکیان کوژران. حەرەسی زەببی جێگەی پیاوی عەدەوی گرتەوە. لەو ئازاتر و بوێرتر نەبینرا. بەردەوام دەیوت.

نحن بنو ضبة اصحاب الجمل　　　نبارز القرن اذا القرن نزل

ننعى ابن عفان باطراف الاسل　　　الموت احلى عندنا من العسل

ردوا علينا شيخنا ثم بجل

یانی: ئێمە پیاوانی بەنی زەببە، پارێزەرانی وشترین، کاتێك شەڕکەر روبەرومان ببێتەوە، شەڕی لەگەڵ دەکەین. بەنوکی ڕمە نەرم و باریکەکان لەنێوان خۆمان هەواڵی مەرگی کوڕی عوسمان دەدەین. مەرگ لەناو زاری ئێمە لەهەنگوین شیرینترە. پیرەپیاوەکەمان بۆ ئێمە بگەڕێنەوە وئەوسا وەڵامی راست ببیستن.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم هۆنراوەیە هی وەسیم کوڕی عەمرۆ زەببی بو و لەرۆژی شەڕی وشتر هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ هاندەدا. ئەو جڵەوی ئەسپەکەی گرت و وتی:

نحن بنو ضبة لا نفر　　　حتى نرى جماجما تخر

يخرمنها العلق المحمر

یانی: ئێمە بەنی زەببەین و راناکەین تا نەبینین سەرەکان لەسەر خاك کەوتون و خوێنی سور لەوان دەرژێتە سەر زەوی.

دوبارە وتی:

يا امتا يا عيش لن تراعي　　　كل بنيك بطل شجاع

یانی: ئەی دایکی ئێمە، ئەی هۆکاری ژیان، مەترسە چونکە هەمو مناڵەکانت پاڵەوانە ئازاکانن.

هەروەها وتی:

يا امتا يا زوجة النبى　　　يا زوجة المبارك المهدى

یانی: ئەی دایکی ئێمە، ئەی هاوسەری پێغەمبەر، ئەی هاوسەری ئەو پیاوە پیرۆزە رزگار بوە.

بەمشێوە بو تا لای وشتر و لەسەر جڵەوەکەی چل پیاو کوژران. عایشە دەڵێت:

وشترەکەم بەهەمان شێوە بەهێز بو تا ئاوازی بەنی زەببەم لەدەست دا. حەفتا پیاو لەقورەیش هەوساری وشترەکەیان گرت و جڵەو لەدەست کوژران. لەوانەی جڵەوی وشترەکەیان گرتە دەست یەکیان محەممەد کوڕی تەڵحە بوو وتی: ئەی دایکە، فەرمانی خۆت بەمن بفەرمو. عایشە وتی: فەرمان بەتۆ دەدەم ئەگەر دەتەوێت بمریت، باشترینی مرۆڤەکان بیت. دوای ئەمە کەس لەو نزیک نەدەکەوتەوە مەگەر ئەوەی محەممەد هێرشی دەکردە سەر و دەیوت (حا، میم، لەهاوکاری خوا بەدور بن). چەند کەسێك لەدەوری کۆبونەوە و کوشتنیان تایبەت کرد بەخۆیان: موکەعبەری ئەسەدی، موکەعبەری زەببی، معاویە کوڕی شەدادی عەبەسی و عەففاری سەعدی نەسری. یەك لەوان بەرم لێیدا و وتی:

و اشعث قوام بايات ربه ... قليل الاذى فيما ترى العين مسلم
هتكت له بالرمح جيب قميصه ... فخر صريعا لليدين و للفمم
يذكرنى حاميم و الرمخ شاجر ... فهلا تلا حاميم قبل الثقدم
على غير شىء غير ان ليس تابعا ... عليا و من لا يتبع الحق يندم

یانی: دریغ لەو پیاوە ڤژ ژاکاوە کەئایاتی خواوەندی بەردەوام دەخوێند: ئازاری کەم و وای نیشاندەدا موسوڵمانێکی دین پاکە. بەرم یەخەی زرێکەیم دڕاند و ئەو لەسەر دو دەست و دەم کەوتە سەر زەوی. بەهەمان شێوە کەرم لەجەستەی دەچەقی (حا میم)ی دەخوێند. بۆ (حا میم)ی پێش روبەروبونەوە نەخوێند. تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو شوێنکەوتەی عەلی نەبو وهەر کەس شوێن راستی و دروستی نەکەوێت پەشمیان دەبێتەوە.

دواتر عەمرۆ کوڕی ئەشرەف جڵەوی وشترەکەی لەدەست گرت و هەر کەس لێی نزیك کەوتەوە، بەشمشێر کردی بەدوکەرتەوە. حەرەس کوڕی زوهەیری ئەزدی روبەروی بویەوە و وتی:

يا امتا يا خير ام نعلم ... اما ترين كم شجاع يكلم
و تختلى هامته و المعصم

یانی: ئەی دایکی ئێمە، ئەی باشترین دایك کەدەیناسین، ئایا نابینی چەندە پیاوی ئازا بریندار دەبن، نابینی چەندە سەری سەرفەراز و دەست لەجەستە جیا دەبنەوە و

هەڵدەومرن.

ئەم دوانە دوجار لەیەکیاندا و هەردوکیان کوژران. پیاوە شەڕدیتو وبەهێز وبوێرەکان دەوری عایشەیان گرت. هەر کەس جڵەوەکەی دەگرت، دەکوژرا. هەرکەس ئالاَ و جڵەوەکەی هەڵدەگرت، لای دەوروبەر پەیوەست بەوشترەکە لەقەڵەم دەدرا و دەیوت: فلاّن کوڕی فلاّنم. سوێند بەخوا لەدەوری ئەو شەڕیان دەکرد، مەرگ دادەباری و جگە لەهەوڵدان و شەڕ کردن دەستی کەس بەو نەدەگەیشت. هەرکەس لەهاوەلاّنی عەلی ئاهەنگی ئەوی کرد، کوژرا یا هەلاّت و نەگەڕایەوە. عودەی کوڕی حاتەم هێرشی کردە سەرئەوان و چاوی بریندار بو. عەبدالله کوڕی زوبەیر هات و هیچی نەوت. عایشە پرسی: کێیت؟ وتی: کوڕی براکەت. عایشە وتی: هاوار لەئەسما چونکە داغدار بوا ئەشتەری روبەروی بویەوە. شەڕیان کرد و مالکی ئەشتەری لێیدا و برینێکی گەورەی لەسەری دروست کرد. عەبدالله لێدانێکی سوکی لەئەشتەردا. باوشەیان بەیەکدا کرد و هەردوکیان کەوتنە سەر زەوی و لەیەك دەناڵاّن. کوڕی زوبەیر وتی:

اقتلونی مالکا و اقتلوا مالکا معی

یانی: من بکوژن و مالکیش، هاوڕێ لەگەڵ من مالکیش بکوژن.

ئەگەر دەیانزانی مالك چ کەسێکە، بێ گومان دەیانکوشت، ئەویان بەناوی ئەشتەر ناسیبو. لەبەر ئەمە هاوەلاّنی عەلی و عایشە بەپەلە بۆ ئەوێ ڕۆشتن و ئەوانیان لەیەك جیا کردەوە. مالکی ئەشتەر دەڵێت: چاوم بەعەبدولرەحمان کوڕی عەتاب کەوت و بینیم لەگەڵ سەرسەختترین و بێزار ئەبوترینی کەسەکان روبەروم بەلاّم زۆری نەخایاند کردم بەدوکەرتەوە. روبەروی ئەسوەد کوڕی عەوف بومەوە و دەترسام لەدەستی ئەو رزگارم نەبێت تا ئەو رادەی ئارەزوم کرد خۆزگە ئەوم نەدیایە، بەلاّم کاتێك شەڕمان دەست پێکرد، لەبەرابەر من کەوتە لەرزین وەك مەلێك پەرپەڕ بو. دواتر جەندەب کوڕی زوهەیری غامدی هێرشی کردەسەرم و تەنیا یەك جار شمشێرم هێنایە خوار و ماڵئاواییم لەم دنیا پێکرد. دەڵێت: روبەروی عەبدالله کوڕی حەکیم کوڕی حەزام بومەوە و بینیم ئالاّی قوڕەیشیەکانی لەدەستدایە و لەگەڵ عودەی کوڕی حاتەم شەڕ دەکات و ئەم دوانە هاوشێوەی دو وشتری نێر هەوڵ دەدەن و بەهیچ ناگەن. من وعودەی هێرشمان کردە سەری و کوشتمان. دەڵێت: ئەسوەد کوڕی ئەبی

ئەلبەختەری جڵەوەکەی گرتەدەست و کوژرا وئەویش قوڕمشی بو. دوبارە عەمرۆ کوڕی ئەشرەف هەڵیگرت و شەرابی مەرگی چێشت و هاورێ لەگەڵ ئەو سیانزەکەس لەئەندامانی بنەماڵەکەی لەناوچون. ئەو ئەزدی بو. مەروان کوڕی حەکەم بریندار بو و عەبدالله کوڕی زوبەیر سی و حەوت برینی سوك و قورسی لەشمشێر و تیر و ڕم بەجەستەیەوە دیار بو. دەڵێت: شەڕێکی قورستر لەشەری ئەشتەرەم نەبینیوە. هیچ کام لەئێمە (هاوەڵانی عەلی) پشتمان نەدەکردە شەڕ و هەموان لەکێوێکی ڕەش دەچوین. هەرکەس جڵەوی وشترەکەی لەدەست گرت کوژرا. عەلی بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: قاچی وشترەکە ببڕن چونکە ئەگەر ئەو وشترە لەناو ببەن، ئەوان دەست لەشەڕ هەڵدەگرن و بڵاوەی لێدەکەن. پیاوێك لەوشترەکەیدا و وشتر کەوتە سەر زەوی. هیچ کات دەنگێکی مەترسیدارتر لەدەنگی ئەو وشترەم نەبیستبو. ئاڵای ئەزدیەکانی کوفە لەدەستی موخەنەف کوڕی سەلیمدا بوو کوژرا و کەوتە دەست سەعقەب کوڕی سولەیم و دواتر براکەی عەبدالله کوڕی سولەیم و ئەویش کوژرا. دواتر عەلا کوڕی عوروە ئالاکەی هەڵگرت و هێشتا لەدەستیدابو، سەرکەوتن روخساری خۆی نیشاندا. ئاڵای عەبدقەیس لەخەڵکی کوفە بەدەستی قاسم کوڕی سولەیم بو و ئەویش کوژرا و هاورێ لەگەڵ ئەو زەید کوڕی صوحان و سیحان کوڕی صوحان کوژران. چەند کەسێکی دیکە هەڵیانگرت و کوژران کەیەکیان عەبدالله کوڕی روقیە بو. دواتر مەنقەز کوڕی ئەعمان هەڵیگرت و تەسلیمی کوڕەکەی مورە کوڕی مەنقەزی کرد. ئاڵای بەکر کوڕی وایل لەناو بەنی زوهەل و لەدەستی حەرەس کوڕی حسانی زوهەلیدابو. ئەو هاتە پێش و هاواری کرد: ئەی خەڵکی بەکر، هیچ کام لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا لای ئەو پێگەیەکی بەرزتر لەعەلیان ئەبو، هاوکاری بکەن. پێشڕەوی کرد و شەڕی کرد و کوڕەکەی کوژرا. پێنج کەس لەئەندامانی بنەماڵەکەی کوژران و حەرەس خۆیشی کوژرا. سەبارەت بەو وتیان:

انعی الرئیس الحرث بن حسان          لال ذهل و لال شیبان

یانی: هەواڵی مەرگی گەورەپیاو حەرەس کوڕی غەسان بەبنەماڵەی زوهەل و بنەماڵەی شەیبان دەگەیێنم.

یەکێك لەپیاوانی بەنی زوهەل وتی:

تنعى لنا خير امرىء من عدنان　　　عند الطعان و نزال الاقران

یانی: هەواڵی مەرگی باشترین پیاو لەعەدنان بەئێمە دەدەیت کە لەکاتی شەڕ لەگەڵ شەڕکەران و روبەروبونەوە لەگەڵ دلێران، زیاتر لەهەموان بەگیان هەوڵی دەدا.

براکەی بشر کوڕی حسان وتی:

انا ابن حسان بن خوط و ابی　　　روسل بکر کلها الی النبی

یانی: من کوڕی حسان کوڕی خوتم و باوکم نێردراوی هەمو بەکریەکان بەرەو بارەگایی پێغەمبەری خوابو.

پیاوانێك لەبەنی مەخدوج کوژران و سی وپێنج کەس لەبەنی زوهەل. پیاوێك لەگەرمەی شەڕ بەبراکەی وت: ئەی برای من، چەندە باش شەڕ دەکەین، خۆزگە لەسەر شارێگەی راستی و دروستی دەبوین! براکەی پێی وت: خەڵکان رویان کردۆتە لارێکانی راست و چەپ و ئێمە خۆمان خستە داوێنی بنەماڵەی پێغەمبەر، کەواتە لەسەر شارێگەی راستی و دروستین چونکە شوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالبین. ئەو دوانە شەڕیان کرد تا کوژران. لەو رۆژەدا عومەیر کوڕی ئەهلەبی زەببی بریندار بو. پیاوێك لەهاوەڵانی عەلی کە لەناو بریندارەکاندا بو و بەقاچ ئەوان دەگەڕا، ئەوی دۆزیەوە و بینی لەسەر گومڕایی و کوژرانی بێهۆی خۆی بەمشێوەیە داخ و کەسەر دەخوات:

لقد اوردتنا حومة الموت امنا　　　فلم ننصرف الا و نحن رواء

لقد كان فلا نصر ابن ضببة امه　　　و شيعتها مندوحة و غناء

داطعنا قريشا ضلة من حلومنا　　　و نصرتنا اهل الحجاز عناء

اطعنا بنی تميم بن مرة شقوة　　　و هل تيم الا اعبد و اماء

یانی: دایکمان ئێمەی بردە لەوەرگای مەرگ و نەگەڕاینەوە تا ئەوەی هەمومان تێربوین. لەهاوکاری کردنی کوڕی زەببە بۆ دایکی خۆی و شوێنکەوتوانی ئەم دایکە، رێگەچارەیەك بو و ئەم ئەندازەیە بۆ ئەم دایکە خۆپەسەندە بەسندەی دەکرد. لەروی گومڕایی و لەسەر بنەمایی گومانە فیرۆکانی خۆمان هاوکاری قورەیشیەکانمان کرد و هاوکاری کردنی ئێمە بۆ حیجازیەکان هۆکاری رەنج و ئازار بو. لەروی بەدبەختی و گومڕایی، بەدوای بەنی تەمیم کوڕی مورە بەرێکەوتین، ئایا ئەمانە جیاوازن

لەدەستەیەك كەنیز و كۆیلەی سوك و ریسوا؟

پیاوێك پێی وت: بڵێ خوایەك جگە لەخوا نیە. عومەیر كوڕی ئەهلەب پێی وت، وەرە نزیك و بانگەوازی مەرگ بەگوێمدا بڵێ چونكە گوێچكەم كەرە. پیاو لێی نزیك كەوتەوە، عومەیر گوێچكەی ئەوی بەدیان گرت و لێی كردەوە.

سەبارەت بەلەناو بردنی وشترەكە ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیكەیش داوە بەمشێوەیە:

قەعقاع كوڕی عەمرۆ چاوی بەمالكی ئەشتەر كەوت كە لەشەڕ لەدەوروبەری وشتر دەگەڕایەوە. قەعقاع پێی وت: لەگەڵ من ناگەڕێیتەوە؟ مالكی ئەشتەر وەڵامی نەدایەوە. قەعقاع وتی: ئەی مالك ئێمە بۆ شەڕی یەكتر لەتۆ شارەزاترین. قەعقاع هێرشی برد و جڵەوی وشترەكە لەدەستی زوفەر كوڕی حەرەسدا بو و ئەم دوایین كەس بو جڵەوی وشترەكەی لەدەست گرت. هەمو پیاوكانی بەنی عامر لەشەڕ لەدەوری وشترەكە كوژرابون. زوفەر كوڕی حەرەس بەردەوام سرودی شەڕی دەخوێند و دەیوت:

یا امتا مثلك لا یراع كل بنیك بطل شجاع

لیس بوهواه و لا براع

یانی: ئەی دایكی ئێمە، كەسێكی وەك تۆ بێ پەنا نامێنێتەوە چونكە هەمو كوڕەكانت پاڵەوانە ئازاكانن، نە ریسوان، نەترسەنۆك.

قەعقاع كوڕی عەمرۆ وتی:

اذا وردنا اجنا جهرناه و لایطاق ورد ما منعناه

یانی: كاتێك بڕۆینە لەوەرگەیەكی بۆگەن كردو و رزیو، پاك و خاوێنی دەكەینەوە كەس ناتوانێت هەنگاو بخاتە ناو ئەو لەوەرگەیی ئێمە دەیپارێزین.

كەلایی روبەروی زوفەر كوڕی حارس بویەوە و خەڵكی عامر رویان تێكرد و هەمویان كوژران. قەعقاع بەبوجیەر كوڕی دەلجەی( لەهاوەڵانی عەلی) وت: ئەی بوجەیر كوڕی دەلجە، هاورێكانت بانگ بكە تا ئەو وشترە شومە لەناو ببەن. بوجەیر هاواری كرد: ئەی بنەماڵەیی زەببە، ئەی عەمرۆ كوڕی دەلجە، من بۆ لای خۆت بانگ بكە، پیاو ئەوی بۆ لای خۆی بانگ كرد. عەمرۆ كوڕی دەلجە وتی: ئایا تا ئەو كاتەی بۆ لای ئێوە دەگەڕێمەوە، پارێزراوم؟ وتی: بەڵێ. ئەو قاچی وشترەكەی لەزەوی بڕی و هاوار لەقوڕگی وشترەكەدا لولی خوارد و ناڵاندی. قەعقاع بەدەوروبەرەكانی خۆی وت:

ئێوە لەئەماندان. ئەو و زوفەر ڕێککەوتن تا بەندی کۆپانی وشترەکە ببڕن. کەژاوەکەیان هەڵگرت وخستیانە سەر زەوی. کەژاوەکە بەهۆی تیرباران کردنەوە وەك ژیشکی لێهاتبو. دواتر ئەو دوانە بەدەوری کەژاوەکەدا سوڕانەوە و ئەوکەسانەی لەدەوری ئەشتەر بون، رایان کرد. کاتێك وشترپەرستەکان شکەستیان خوارد، عەلی فەرمانی بەجارچیەکدا و جاڕیدا: ئەی سوپایی ئیسلامی و پەیام هێنەرانی دادپەروەری، شوێن هەڵاتوان مەکەون و برینداریەکان ئازار مەدەن و هەنگاو مەخە ناو ماڵی هچ کەسێك. عەلی فەرمانی بەچەند کەسێکدا و کەژاوەکەیان لەناو کوژراوەکان هێنایەدەر. فەرمانی بەبراکەی محەممەد کوڕی ئەبی بەکردا سەراپەردەیەك بۆ عایشە هەڵبدات. پێی فەرمو: بزانە ئایا عایشە برینداره یا نە. محەممەد کوڕی ئەبی بەکر سەری بردە ناو کەژاوەکە. عایشە پرسی: کێیت؟ محەممەد وەڵامی دایەوە: دوژمنترین کەسەکانت بەتۆ. ژن پرسی: کوڕی خوسعەمیە؟ محەممەد وتی: بەڵێ. ژن وتی: باوکم بەقوربانی تۆ بێت، سوپاس بۆ خوا کەزیانت بەرنەکەوت.

دەڵێن: کاتێك وشترەکە کەوت، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر هاوڕێ لەگەڵ عەماری یاسر بەرەو لای ڕۆشتن و کەژاوەکەیان هەڵگرت و بردیانە شوێنێکی دور لەگرفتەکانی مەروان. محەممەد دەستی بۆ ناو کەژاوەکە برد. عایشە پرسی: کێیت؟ محەممەد وتی: برا چاکەکارەکەت. ژن وتی: ڕۆژگارێکی خراپت هەیە. محەممەد پرسی: ئایا زیانت بەرکەوتوە؟ عایشە وتی: تۆ کارت چیە؟ محەممەد وتی: گومڕاکان چیان لێهات. عایشە وتی: ئەوانەی ڕێگایان دۆزیبویەوە. عەمار پێی وت: ئەی دایکە، شمشێر وەشاندنی ئەمڕۆی کوڕەکانت چۆن بینی؟ عایشە وتی: من دایکی تۆ نیم. عەمار وتی: دایکی منیت هەرچەندە نەخوازیت. عایشە وتی: شانازی بەخۆتان دەکەن چونکە سەرکەوتن و ئەم بارودۆخە ستەمکارانەتان دروست کرد. زۆر دورە، سوێند بەخوا کەسانێکی بەم کردەوە و کردارە هیچ کات بەسەرکەوتنی ڕاستەقینە ناگەن.

ئەوان کەژاوەی عایشەیان هەڵگرت وبردیان کەنارێك و ڕێگەیان نەدا کەس لێی نزیك ببێتەوە. عەلی ڕۆشتە لای عایشە و پرسی: ئەی کەنیز، چۆنی؟ عایشە وتی: باشم. عەلی وتی: خوا بتبەخشێت. عایشە وتی: هەروەها تۆیش. ئەعیەن کوڕی زوبەیعە کوڕی ئەعیەنی موجاشعی هات وسەری بردە ناو کەژاوەکە. عایشە وتی: ون

بە، خوا نفرینت بکات. ئەعیەن وتی: سوێند بەخوا دەبینم خودی حومەیرایە (کچی سوروسپی). عایشە وتی: خوا پەردەکەت بدڕێت، دەستت ببڕێت و شەرمت ئاشکرا بکات. ئەوەندەی نەخایاند ئەعیەن کوژرا و دەستی لەجەستەی جیابویەوە و جەستەی روتی کەوتە وێرانەیەك لەوێرانەکانی ئەزدیەکان. دواتر گەورەکانی کوفە ڕۆشتنە لای عایشە و قەعقاع کوڕی عەمرۆ هاورێیەتی ئەوانی دەکرد و سڵاوی لەعایشە کرد. عایشە وتی: دوێنی دوپیاوم بینی، پیاوانە شەڕیان دەکرد وتێدەکۆشان و سرودی شەڕی خۆیان بەم شێوە و بەو شێوە دەخوێند، ئایا هاوتا بەسریەکەی خۆت دەناسیت؟ قەعقاع وتی: بەڵێ، ئەو کەسە بو دەیوت: نامێهرەبانترین دایکێکی کەدەتناسم. درۆی کرد. تۆ مێهرەبانترین دایکی بەڵام سەرت لەبەرابەر راستی و دروستی دانەنواند. عایشە وتی: سوێند بەخوا ئارەزوم دەکرد بیست ساڵ پێشتر مردبوم.

قەعقاع لای عایشە هاتەدەر و ڕۆشتە لای عەلی. عەلی وتی: سوێند بەخوا ئارەزوم دەکرد بیست ساڵ پێشتر دەمردم. عەلی ئەو رۆژە دوایی کۆتایی شەڕ وتی:

| | |
|---|---|
| الیك اشكو عجری و بجری | ومعشرا اغشوا علی بصری |
| قتلت منهم مضرا بمضری | شفیت نفسی و قتلت معشری |

یانی: ئەی خوایە، لەدەرد وئازاری خۆم ناڵەم بۆ دەرگای تۆ دەبەم، گلەیی لەو کەسانە دەکەم خۆڵیان پرژاندە چاوی بینایی من هەرچەندە نەیانتوانیی بیناییم لێ بسێنن. لەناو ئەوان موزەریەکانم لەتۆڵەی خوێنی موزەریەکانی خۆم کوشت، گیانم ئارام بویەوە بەڵام کەسەکانی خۆم کوشت.

(شەڕی وشتر لەرۆژی یەك شەممە دەی جمادی الثانی ساڵی ٣٦/٤ دێسامبەری ٦٥٦ زایینی رویدا.

کاتێك شەو داهات، براکەی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئەوی بردە ناو بەسرە و لەماڵی عەبداللە کوڕی خەلەفی خوزاعی لای صەفیە کچی حەرەس کوڕی ئەبی تەڵحە کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی عوسمان کوڕی عەبدئەلدار دایکی تەڵحەی تەڵحات کوڕی عەبداللە کوڕی خەلەف جێگەی کردەوە. بریندارەکان شەوانە لەناو کوژراوەکان هاتنەدەر و خزانە ناو بەسرە. عەلی سێ رۆژ لەبەسرە مایەوە و فەرمانی بەخەڵك دا مردوەکانی خۆیان بەخاك بسپێرن. کاتێك لای لاشەی کەعب کوڕی سور تێپەڕی کرد،

وتی: ئایا گومان دەکەن ئەو هاورێ لەگەڵ نەزانەکان هاتەدەر وئەم (حبر) ((زانای جولەکە) لێرە لەبەرابەر ئێوەیە! لای جەستەی عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب تێپەڕی و وتی: ئەمە لەباشترینی ئەم خەڵکانە بو ( کەکەسانیتر بەدەوری ئەودا دەسوڕانەوە) خەڵك رازی بون، بەیعەت لەگەڵ عەلی ببەستن و لەپشت سەری ئەو نوێژ بخوێنن. لای جەستەی کوژراوی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله تێپەڕی و وتی: ئەی هاواری من لەتۆ ئەی باوکی محەممەد! هەموان لەلایەن خواوەن هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/۲/۱۵٦) سوێند بەخوا هیچ کات حەزم نەدەکرد بەمشێوەیە قورەیشیەکان لەناو خاك و خوێندا ببینم. سوێند بەخوا تۆ بەهەمان شێوەیت شاعیر وتویەتی:

فتی کان یدنیە الغنی من صدیقە اذا ما هو استغنی و یبعدە الفقر

یانی: جوامێرێك بویت بێ نیازی ئەوی لەهاورێکەی نزیك دەکردەوە وئەمە لەکاتێکدا بو هاورێی شەرمی نەدەکرد و هەژاری بەهۆکاری دوری دەزانی.

عەلی بەدڵێکی پڕخۆشەویستی و بێ کینە لای کوژراوەکانی لەشکری دوژمن تێدەپەڕی و بەشێوەیەکی چاك وەسفی دەکردن و دەیوت: هەندێك گومان.دەکەن تەنیا بێ سەروپێ کان هاتونەتە شەڕی ئێمە، ئەی ئەم خۆپارێزە تێکۆشەرە لەناو ئەواندا چی دەکات! لەسەر کوژراوانی هەر دوسوپا لەخەڵکانی بەسرە و کوفە نوێژی خوێند. فەرمانیدا دەست و پێکان لەگۆڕێکی گەورەدا بەخاك بسپێرن. ئەوەی لەناو لەشکرگەدا بو، کۆیکردەوە ورەوانەی مزگەوتی بەسرەی کرد و وتی: هەرکەس هەر شتێك دەناسێتەوە، هەڵیگرێتەوە مەگەر ئەو کەرەستانەی لەگەنجینە وەرگیراون و نیشانەی دەوڵەتیان پێوەیە. هەمو کوژراوەکان دەهەزار کەس بون. نیوەیان لەهاورێیانی عەلی و نیوەیان لەهاورێیانی عایشە. ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. لەخەڵکی زەببە هەزار کەس کوژران ولەبەنی عودەی لەدەوروبەری وشترەکە حەفتا کەس کەهەمویان قورئان خوێن بون جگە لەگەنجەکان و نەخوێندەوارەکان. کاتێك عەلی لەشەڕ تەواو بو، ئەحنەف کوڕی قەیس هاورێ لەگەڵ بەنی سەعد ڕۆشتنە لای ئەو. ئەوان لەشەڕ خۆیان بەدور گرتبو و لەسوچێکدا لەکاروبارەکان ورددەبونەوە. عەلی پێی وت: چاوەڕوانی کۆتایی پێشهاتەکانت دەکرد تا بزانی چیمان بەسەر دێت؟ ئەحنەف وتی: لەوەی کردومە خۆم بەچاکەکار دەزانم بەفەرمانی تۆ بو ئەوەی ئەنجام درا ئەی

سەروەری باوەڕداران. مێهرەبان بەچونکە ئەو ڕێگەی گرتوتەبەر، زۆر درێژە. تۆ سبەینێ زیاتر لەدوێنێ پێویستت بەمن دەبێت و هاوڕێیەتی من بەپاك بزانە و من بۆ بەیانی خۆت هەڵبگرە. بەم شێوە مەڵێ چونکە بەردەوام چاکەخوازی تۆ بوم و هەم.

عەلی ڕۆژی دوشەممە ڕۆشتە شری بەسرە. خەڵك بەناڵاکانی خۆیان بەیعەتیان لەگەڵ کرد و تەنانەت برینداردەکان وئەمان دراوەکان هاتن و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکرە داوای ئەمانی کرد و هاتە لای عەلی. هەموان بەیعەتیان لەگەڵ کرد. عەلی پێی وت: چۆن دەبێت هەڵس و کەوت بکەم لەگەڵ کەسێك هاوکاری منی نەکرد و چاوەڕوانی گۆڕانکاری ڕوداوەکانی دەکرد؟ مەبەستی ئەبوبەکرە بو. عەبدولرەحمان وتی: سوێند بەخوا نەخۆشە و خوازیاری تەندروستی تۆیە. عەلی وتی: لەپێش من بەرێگادا برۆ! عەبدولرەحمان لەگەڵی بەرێکەوت و ڕۆشتە لای باوکی. کاتێك عەلی گەیشتە لای وتی: ئەمە دەردێکی ئاشکرایە. ئەبوبەکر داوای لێخۆشبونی لەگوناحەکەی خۆی کرد و عەلی لێیخۆش بو. ویستی ئەو وەك فەرمانداری بەسرە دەست نیشان بکات بەڵام ڕازی نەبو و وتی: پیاوێك لەخزمەکان وەك فەرماندار دەست نیشان بکە تا خەڵك بەو ئارام بگرن. من لەکاتی پێویست راوێژی لەگەڵ دەکەم. عەلی وئەبوبەکرە لەسەر ئەم پەیمانە لەیەك جیابونەوە کەعەبداللە کوڕی عەباس وەك فەرمانداری بەسرە دەست نیشان بکرێت. زیاد کوڕی نوبیەی کردە لێپرسراوی باج و خەراج و گەنجینیەی بەو سپارد و فەرمانی بەعەبداللە کوڕی عەباسدا گوێ لەوتار و ئامۆژگاریەکانی ئەو بگرێت. زیاد لەم کاتەدا ڕێگەی گۆشەگیری بڕیبو. دواتر ڕۆشتە لای عایشە کە لەماڵی عەبداللە کوڕی خەلەف بو و ئەمە گەورەترین ماڵی بەسرە بو. بینی ژنان بۆ عەبداللە کوڕی خەلەف و عوسمان کوڕی خەلەف شین دەگێڕن. عەبداللە لەسوپاکەی عایشەدا کوژرابو و عوسمان لەسوپاکەی عەلیدا. صەفیە هاوسەری عەبداللە سەری داپۆشیبو و دەگریا. کاتێك ئەوی بینی، هاواری کرد: ئەی عەلی، ئەی بکوژی هاوڕێیان، ئەی ئەو کەسەی بڵاوەت بەکۆڕەکان کرد! خوا کوڕەکانت بێ باوك بکات بەهەمان شێوە کەکوڕەکانی عەبداللەت بێ باوك کرد! عەلی وەڵامی نەدایەوە. عەبداللە ڕۆیشتە لای عایشە و سڵاوی لێکرد و لای ئەو دانیشت و وتی: صەفیە نامێهرەبانانە لەگەڵ من قسەی کرد بەڵام لەو

کاتەوەی کچێکی منالّ بو، نەمدیوە.

کاتێك عەلی ڕۆشتەدەر، جارێکی دیکە صەفیە لەسەر ڕێگاکەی دەرکەوت و هەڵیت و پلیتی هێنایە سەرزمان. عەلی وەلآمی نەدایەوە. دوبارە دەنگی جوێندان لەناو ماڵەکە بەرز بویەوە. ئێسترەکەی خۆی ڕاگرت و فەرموی: بڕیارمدا دەرگای ئەو ماڵە بکشێنم و هەمو دانیشتوانەکەی بکوژم. دەستەیەك لەبریندارەکان وزیان بەرکەوتوەکان لەوێ بون. عەلیان لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار کردەوە و ئەو خۆی بیّ ئاگا نیشاندا و لای ئەوان تێپەڕی و بێدەنگی هەڵبژارد. شێوازی کارەکەی بەمشێوە بو: هیچ هەلآتوێکی نەدەکوشت، برینداەکانی ئازار نەدەدا، پەردەیەکی بەرز نەدەکردەوە و درەمێکی لەکەس وەرنەدەگرت.

کاتێك عەلی لای عایشە هاتەدەر، پیاوێك لەئەزد پێی وت: سوێند بەخوا ئەم ژنە بەسەر ئێمەدا زالّ نابێت! عەلی توڕەبو و وتی: بێدەنگ بە! هیچ پەردەیەك مەدڕێنە، مەڕۆرە ناو هیچ ماڵێك، هیچ ژنێك بەقسەی ناخۆش مەڕەنجێنە و ئەگەر ژنان هێرش بکەنە سەر ئێوە وپەردەی ئابڕوی ئێوە بدڕن ورێبەرەکانتان بەنەزان وچاکەکانتان بەخراپە ناو ببەن، زیانیان پیّ مەگەیێنن چونکە ژنان خەڵکانێکی دلّ ناسکن، کاتێك ئەم ژنانە بتپەرەست بون، فەرمانیان بەئێمەدابو وازیان لیّ بێنین چ بگات بەئێستا کەموسوڵمانین.

عەلی بەرێکەوت و لەم کاتەدا پیاوێك خۆی پێگەیاند و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوپیاو لەبەردەگای ماڵەکە وەستان و بەزمان کەسێکیان ڕەنجاند و گومان دەکرێت وتاری ئەم دوانە لای تۆ لەجوێنەکانی صەفیە بەئازارتر بێت. عەلی پرسی: هاوار لەتۆ، ئەگەری هەیە ئازاری عایشەیان دابێت؟.وتی: بەڵێ. یەکێك لەو دوپیاوە بەعایشەی وت: ئەی دایکی ئێمە، خوا پاداشتی نامیهرەبانیت بداتەوە! ئەویتریان وتی: ئەی دایکی من، تۆبە بکە چونکە لەرێگەی ڕاست دورکەوتویتەوە! عەلی قەعقاع کوڕی عەمرۆی ڕەوانە کرد تا دانیشتوانی ئەو ماڵە بێنن. ئەوان وتیان: دو پیاو لەئەزدیەکانی کوفە یانی عێجلان کوڕی عەبداللە و سەعد کوڕی عەبداللە بون. عەلی سەد قامچی لەم دوانەدا و ڕوتی کردنەوە..

ئەو ڕۆژە عایشە پرسیاری لەکوژراوەکانی خەڵك دەکرد چ ئەوانەی لەگەڵی بون چ

ئەوانەی دژی بون. خەڵك لای ئەو كۆببونەوە. هەرجار هەواڵی مەرگی یەكێكیان دەدا، دەیوت: خوا لێی خۆش بێت. پێیان وت: ئەمە چۆن دەبێت؟ وتی: پێغەمبەر وتی: فلاَن كەس لەبەهەشتە و فلاَن كەس لەبەهەشت. عەلی وتی: هیوادرام هەموی ئەوانەی لەشەڕكەرانی ئەم شەڕە دڵێكی پاك وئەندێشەیەكی تابانیان بۆ خوا هەبوە، بەفەرمانی خوا بڕۆنە بەهەشت.

دواتر عەلی ئەوەی پێویست بو لەساز و بەرگ وبار وبنەی ژیان و چوارپێ و خواردن و هەر جۆرە كالاَیەكی بۆ عایشە ئامادە كرد و هەمو ئەو كەسانەی لەشەڕ رزگاریان ببو، لەگەڵ ئەودا رەوانەی كرد جگە لەوكەسانەی دەیانویست لەبەسرە بمێننەوە. بۆ عایشە چل لەخاتونە بەرێزەكانی بەسرەی هەڵبژارد و براكەی محەممەد كوڕی ئەبوبەكری لەگەڵ ئەو رەوانە كرد. كاتێك رۆژی كۆچ كردنی عایشە گەیشت، عەلی هات وهاوشێوەی ماڵئاوایی كەرێك لەسەر رێگاكەی وەستا و خەڵكیش بۆ ئەوێ هاتن. عایشە هاتەدەر و سلاَوی بۆ نارد و ئەم قسانەی هێنایە سەرزمان: ئەی منداڵەكانی من با لەسەركۆنەكردنی یەك دەست هەڵگرین، سوێند بەخوا لەكۆنەوە لەنێوان من و عەلی هیچ لەئارادا نەبوە جگە لەوەی لەنێوان ژن و خزمەكانی مێردەكەی دروست دەبێت. ئەو لەگەڵ هەمو بەڵگەكانی من، لەچاكەكارانە. عەلی وتی: راست دەكات، لەنێوان من وئەو جیاواز لەوەی ئاماژەی پێدا، هیچ لەئارادا نەبوە. ئەو هاوسەری پێغەمبەرەكەتان لەم دنیا و لەو دنیایە.

عایشە رۆژ شەممە یەكی رەجەب/٢٤ دێسامبەری٦٥٦ بەرێكەوت و عەلی تا چەندین فەرسنگ لەگەڵی رۆشت و كوڕەكانی رەوانە كرد تا یەك رۆژ رێگای لەگەڵ ببڕن. ئەوی رەوانەی مەككە كرد، عایشە حەجی كرد وبۆ مەدینە گەڕایەوە. كاتێك عەماری یاسر سلاَوی لێكرد، پێی وت: چەند دورە ئەم رێپێوانەی تۆ لەوەی فەرمانیان پێدایت وپێشنیاریان پێكردیت! عایشە وتی: لەو كاتەوەی تۆ دەناسم، بێژەری بێ چەند و چونی راستی و دروستی بویت. عەمار وتی: سوپاس بۆ خوا كە لەسەر زمانی تۆ داوەری لەبارەی منەوە كرد.

سەبارەت بەشكاوەكان، ئاماژەمان بەبارودۆخی ئەواندا, یەكێك لەوان عوتەبە كوڕی ئەبی سوفیان بو. ئەو و عەبدولرەحمان كوڕی حەكەم و یەحیا كوڕی حەكەم هاتنەدەر

ولەشارەکاندا بڵاوبونەوە. عوسمە کوڕی ئوبەیری تەمیمی چاوی بەوان کەوت. پێشنیاری پێدان: ئایا دەتانەوێت پەناتان بدەم؟ وتیان: بەڵێ. ئەوانی گرتەخۆ وپەنای دان و میوانداری کردن تا برینەکانیان چاکبویەوە وئەوانی لەگەڵ چوارسەد سوار بەرەو شام رەوانە کرد. کاتێك گەشتنە دومەئەلجەندەل، وتیان: بەباشی رێزت لەئەماندانەکەی خۆت گرت وئەوەی لەسەر تۆ پێویست بو، ئەنجامتدا. گەڕایەوە. عەبداللە کوڕی عامریش ڕۆشتەدەر و روبەروی پیاوێك بویەوە لەبەنی حەرقوص بەناوی موڕی. موڕی پەنایدا و رەوانەی شامی کرد. مەروان کوڕی حەکەم پەنای بردە بەر مالك کوڕی مەسمەع و ئەویش رێزی لێ گرت و پەنایدا. بەنی مەروان لەکاتی هاتنە سەرکار، ئەم کارەیان بیر خستەوە وئەو لەوان سودی فراوانی دەست کەوت و ئەوان پێگەی بەرزیان پێبەخشی. دەستەیەك دەڵێن: مەروان هاورێ لەگەڵ عایشە لەماڵی عەبداللە کوڕی خەلەف لەدوژمنانی عەلی دابەزی و ئەو ژنەی تا حیجاز هاورێیەتی کرد. کاتێك عایشە بەرەو مەککە بەرێکەوت، مەروان بەرەو مەدینە ڕۆیشت. عەبداللە کوڕی زوبەیر لەماڵی پیاوێکی ئەزدی بەناوی وەزیر دابەزی. عەبداللە پێی وت: بڕۆ لای دایکی باوەڕداران و ئەو لەجێگاکەی من ئاگادار بکەرەوە بەڵام ئاگادار بە محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بەم هەواڵە نەزانێت. پیاو ڕۆشتە لای عایشە و ئاگاداری کردەوە. عایشە وتی: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بێننە لای من. وەزیر وتی: ئەو وتی محەممەد لەم کارە ئاگادار نەکەمەوە. عایشە گوێی لەقسەی نەگرت و کەسێکی بەدوای محەممەد رەوانە کرد و وتی: لەگەڵ ئەم پیاوە بڕۆ تا خوشکەزاکەت بێنیتە لای من. پیاو لەگەڵ ئەو بەرێکەوت و عەبداللە کوڕی زوبەیر و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر پێکەوە هاتنەدەر تا گەشتنە ماڵی عەبداللە کوڕی خەلەف لای عایشە.

کاتێك عەلی لەبەیعەتی خەڵکی بەسرە تەواو بو، دارایی گەنجینەی ژمارد و بەشەشسەد هەزاری(درەم یا دینار) خەملاند. ئەم بڕەی بەسەر ئەو کەسانەی شان بەشانی ئەو شەڕیان کردبو، دابەشی کرد. عەلی وتی: ئەگەر بەسەر شامیەکاندا زاڵ ببن، جیاواز لەبەخششە دیاریکراوەکان، بەهەرکام چەندین بەشی زیادە دەدەم. سەبەئیەکان لەمبارەوە بەناڕەوا قسەیان کرد و بەشێوەیەکی نهێنی رەخنەیان لەعەلی

گرت. هەروەها ئەو کاتەی وتی: خەڵکانی بەسرە تاڵان مەکەن، رەخنەیان لێگرت و وتیان: خوێنی ئەوانمان بۆ رەوا دەکات و سامانەکانیان نارەوا دەکات؟ عەلی وتی: ئەمانە کەسانێکی هاوشێوەی ئێوەن؟ هەرکەس دەست درێژی نەکاتە سەرمان، وەك خۆمانە و هەرکەس سەرسەختی بکات بەگیان و دڵ شەڕی لەگەڵ دەکەین.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ وتی: شتێکی هاوشێوەترم بەهاوتای خۆمان لەشەڕی دڵی دوسوپا لەشەڕی وشتر بەدڵی دوسوپا لەشەڕی سەفین نەدیوە. جارێك هاتینە خۆمان و بینیم بەرمەکانی خۆمان پاشەکشێ بەوان دەکەین و پشت بەبازوەکانی خۆمان دەبەستین و ئەوان بەشێوەیەکی رێك وپێك هەڵس وکەوت دەکەن. ئەگەر پیاوان لەسەرەوی ئەو رێگاوە دەڕۆیشتن، دەیانتوانی خۆڕاگری بکەن. عەبداللە کوڕی سەنانی کاهلی وتی: کاتێك شەڕی وشتر دەستی پێکرد، یەکترمان تیربارن کرد تا تیرەکان تەواو بون. دواتر ڕمەکانمان هەڵگرد و لەسینەی یەکمان چەقاند تا شکان و لەجەستەی ئێمە و جەستەی ئەوان بەجێمان و چنراوێکیان لەئاسن دروست کرد کەئەگەر سوارەکان دەیانویست دەیانتوانی بەسەریدا بڕۆن. دواتر عەلی هاواری کرد: ئەی منداڵی موهاجیرەکان، شمشێرەکان دەرکێشن! دەنگی بەرکەوتنی شمشێرەکان بۆ ئاسمان بەرز بویەوە.

خەڵکانی مەدینە هەمان رۆژی شەڕ، پێش ئاوابونی خۆر، لەشەڕی وشتر ئاگادار بونەوە. لاشخۆرێکی گەورە لەسەر ئاوێك لەدەوروبەری مەدینە دەسوڕا و شتێك بەچنگاڵەکانیەوە هەڵواسرا بو. ئەو شتە لەچنگاڵی کەوتەخوار و خەڵك بینیان دەستی پیاوێکە و لەیەکێك لەپەنجەکانی ئەنگوستیلەیەکە کەنیگاری نگینەکەی (عەبدولرەحمان کوڕی عەتابە). خەڵکانی دانیشتوی مەککە و مەدینە و بەسرە لەو دەست وپێیانەی لاشخۆرەکان بەرەو لای ئەوانیان دەبرد، لەشەڕەکە ئاگادار بونەوە.

عەلی مەبەستی ئەوەی کرد لەبەسرە بمێنێتەوە و کاروبارەکانی ئەم شارە سامان بدات بەڵام سەبەئیەکان ناچاریان کرد بەخێرایی لەو شارە کۆچ بکات چونکە ئەوان بێ فەرمانی ئەو بەرێکەوتن و عەلی بەخێرایی بەدوایی ئەوان بەرێکەوت تا ئەگەر مەبەستی کارە نەشیاوەکان بکەن، رێگریان لێ بکات.

## گێڕانەوەیەکی دیگە سەبارەت بەشەڕی وشتر

سەبارەت بەهۆکارەکانی شەڕی وشتر جگە لەوەی ئاماژەی پێدرا، ئاماژمیان بەگێڕانەوەی دیکە داوە، هەرچەندە لەمبارەوە کۆکن کەهاوەڵانی عایشە بەرێکەوتن و لەبەسرە دابەزین و شەڕی یەکەمیان لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف و حوکەیم ئەنجامدا.

بەڵام رەوانە بونی عەلی کوڕی ئەبی تالب و لەسەر کار لابردنی ئەبوموسا ئەشعەری، سەبارەت بەم بابەتە وتراوە: کاتێك عەلی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری بۆ لای ئەبوموسا رەوانە کرد و ئەو پێشهاتە رویدا کەئاماژەی پێدرا، هاشم کوڕی عەتەبە کوڕی ئەبی وەقاص بەرەو لای عەلی لەرەبزە بەرێکەوت وئەوی لەپێشهاتەکان ئاگادار کردەوە. عەلی ئەوی بۆ لای ئەبوموسا گەڕاندەوە و پەیامیدا: خەڵك بۆ هاوکاری کردنی من رەوانە بکە چونکە من تۆم وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان نەکرد مەگەر ئەوەی بۆ گەیشتن بەرێگەی راستی و دروستی و سەرخستنی، یەکێك لەهاوەڵانی من بیت. ئەبوموسا لەرازی بون بەفەرمانەکە خۆی دورخستەوە.

هاشم بۆ عەلی نوسی: من رۆشتمە لای پیاوێك لەئەندازە تێپەڕی کردوە، خراپەخواز و دوژمنایەتی ئاشکرا. نامەکەی بەموحێل کوڕی ئەبی خەلیفەیی تایی رەوانە کرد.

عەلی کوڕەکەی حەسەن و عەمار کوڕی یاسری رەوانە کرد تا خەڵك بۆ شەڕ هان بدەن. قەرەزە کوڕی کەعبی ئەنساری وەك فەرمانداری کوفە رەوانە کرد و هاوڕێ لەگەڵ ئەو بۆ ئەبوموسای نوسی: حەسەن و عەمارم رەوانە کرد تا خەڵك بۆ شەڕ هان بدەن، قەرەزە کوڕی کەعبم وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان کرد و رەوانەی ئەو دیارەم کرد. سەرکۆنەکراو لەکارەکەی ئێمە خۆت بەدور بگرە، ئەگەر نەیکەیت، فەرمانم بەو داوە شەڕ لەگەڵ تۆ بکات وئەگەر بەسەر تۆدا سەرکەوێت، لەت لەتت بکات. کاتێك پەیك و نامەکە بەئەبوموسا گەیشت، دەستی لەکارەکەی هەڵگرت. حەسەن خەڵکی بۆ شەڕ هاندا و خەڵکان بۆ شەڕ بەرێکەوتن بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا، عەلی بەرەو بەسرە بەرێکەوت.

جەوەن کوڕی قتادە دەڵێت: لەگەڵ زوبەیردابوم و سوارەیەك هاتە لای. سوارە وتی: سڵاو لەتۆ ئەی فەرمانڕەوا. زوبەیر وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە. سوارە وتی: ئەم خەڵکە رویان لەم دیارە کردوە و گەشتونەتە فلان شوێن و فیسارە شوێن. من لەوان کۆنەپۆشتر لەکەڵ و پەلی شەڕ و کەم ژمارەتر و ترسەنۆکترم نەبینیوە. دواتر سوارە گەڕایەوە و سوارەیەکی دیکە هات و وتی: ئەم خەڵکەی رویان لەم دیارە کردوە، گەشتونەتە فلان شوێن و فیسارە شوێن. کاتێك بیستیان خوا ئەم هەمو پیاوە شەڕکەرە وئەم هەمو کەرەستەی شەڕی بۆ ئێوە کۆکردۆتەوە، ترسان و هەڵاتن. زوبەیر وتی: بەسە! سوێند بەخوا ئەگەر عەلی کوڕی ئەبی تالب، دەستەیەك خەوش و خۆڵی دەست کەوێت بۆ شەڕی ئێمە دێت. سوارەکە بەرێگای خۆیدا ڕۆشت.

سوارەیەکیتر گەیشت ولەم کاتەدا سوارەکان دەیانویست لەناو تەپ و تۆز بێنەدەر و دەرکەون. وتی: ئەم خەڵکە رویان لەتۆ کردوە و من چاوم بەعەمار کوڕی یاسر کەوت و گفتوگۆم لەگەڵ کرد. زوبەیر وتی: ئەو لەناو ئەواندا نیە. پیاو وتی: سوێند بەخوا لەناو ئەواندایە. زوبەیر وتی: سوێند بەخوا، خوا ئەوی لەناو ئەوان جێگە نەکردۆتەوە. پیاو وتی: سوێند بەخوا جێگەی کردۆتەوە. کاتێك چەندین جار قسەکەی خۆی دوبارە کردەوە، زوبەیر چەند کەسێکی نارد تا بڕوانن. ئەوان ڕۆشتن، گەڕانەوە و وتیان: ئەو پیاوە راست دەکات. زوبەیر وتی: ئەی هاوار، لوتم لەزەوی درا! هاوار، پشتم شکا! دواتر لەرز دایگرت و کەرەستەکانی شەڕ لەدەستی کەوتە خوار. جەون دەڵێت: وتم: خۆزگە دایکم لەپرسەما دانیشێت! ئەمە ئەو پیاوەیە دەمویست لەرێگاکەیدا بمرم یا لەگەڵ ئەودا بژیم. ئەم بەلایی بەسەر نەهات مەگەر لەبەر ئەو وتارەی لەپێغەمبەری خوایی بیست. جەون بەرێکەوت و لەشەڕ خۆی بەدور گرت و عەلی لەرێگاوە گەیشت. کاتێك خەڵکان لەسەر جێگاکانی خۆیان ئارامیان گرت، زوبەیر و تەڵحەی بانگ کرد و هەر سێکیان لەناوەڕاستی سوپاکەدا وەستان. لێرەدا ئەو گێڕانەوەی پێشتر ئاماژەمان پێدا، سەبارەت بەزوبەیر و گەڕانەوەی ئەو و سوێند خواردن و شکاندنی سوێندەکەی و دانی تاوانیان ئاماژە پێداوە.

کاتێك سوپای وشتر لەسەر شەڕ پێداگریان کرد، عەلی وتی: کام یەك لەئێوە ئەم

قورئانە هەڵدەگرێت و ئەم خەڵکە بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان بانگ دەکات؟ ئەگەر دەستێکی بڕا، بەدەستەکەیتری هەڵیگرێت و ئەگەر ئەویشیان بڕی، بەدیان هەڵیگرێت تا دەیکوژن.

گەنجێك وتی: من ئەو کارە دەکەم.

عەلی لەناو سوپاکەدا جاریدا و جگە لەو گەنجە کەس وەڵامی نەدایەوە. سێ جار ئەم کارەی کرد و دواتر قورئانەکەی بەگەنجەکە سپارد. گەنجەکە ئەوانی بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان بانگ کرد و ئەوان دەستی راستیان قرتاند. بەدەستی چەپی هەڵیگرت و ئەویشیان بڕی. دواتر بەدەم و سینەی هەڵیگرت و خوێن لەروخساری دەباری. سەرئەنجام کوژرا.

عەلی وتی: ئێستا شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان ڕەوایە.

دایکی ئەو گەنجە وتی:

| | |
|---|---|
| لاهم ان مسلما دعاهم | يتلو كتاب الله لا يخشاهم |
| و امهم قائمة تراهم | تامرهم بالقتل لا تنهاهم |

قد خضبت من علق لحاهم

یانی: ئەی خوایە، ئاگادار بە جوامێرێکی موسوڵمانان ڕۆشتە لای ئەوان و ترسی ئەوانی لەدڵ نەنیشت. دایکیان وەستا بو و ئەوانی دەبینی. داوای کوشتاری لێدەکردن و لەم کارە دوری نەدەخستنەوە، ڕیشی هەموویان بەخوێنی ڕەنگ ڕەش ڕەنگ کرابو.

باڵی راستی سوپای عەلی هێرشی کردە سەر باڵی راستی سوپای وشتر. شەڕ دەستی پێکرد و خەڵك پەنایان بۆ عایشە برد. زۆربەیان لەخەڵکانی ئەزد و زەببە بون. شەڕ لەهەڵاتنی خۆر تا نزیکەی نوێژی نیمەڕۆ درێژەی کێشا و سوپای عایشە شکەستیان خوارد و هەڵاتن. خەڵکێك لەئەزد هاواری کرد: هێرش بکەن! محەممەد کوڕی عەلی بەشمشێر لێیدا و دەستی بڕی. پیاو وتی: ئەی ئەزدیەکان رابکەن! ئەوان هاواریان کرد: ئێمە لەسەر ئایینی عەلین. لێرەدا پیاوێك لەبەنی لەیس وتی:

| | |
|---|---|
| سائل بناحين لقينا الازدا | و الخيل تعدوا اشقرا و وردا |
| لما قطعنا كبدهم و الزندا | سحقا لهم فى رايهم و بعدا |

یانی: سەبارەت بەئێمە پرسیار بکە چۆن روبەروی ئەزدیەکان بوینەوە. ئەسپە سور

رەنگ و زەرد رەنگەکان بەغاردان بۆ پێشەوە دەهاتن، جەرگی ئەوانمان هەڵدڕی و جومگەی دەستی ئەوانمان دەقرتاند. دوربن و لەناوچو چونکە ئەندێشەی خراپیان لەسەردا پەروەردە دەکرد.

عەمار کوڕی یاسر هێرشی کردە سەر زوبەیر و بەردەوام ڕمەکەی بەدەوری ئەودا دەسوڕاند.

زوبەیر وتی: ئەی باوکی یەقزان، دەتەوێت بمکوژیت؟.

عەمار وتی: نا، ئەی باوکی عەبدالله، بگەڕێرەوە.

زوبەیر گەڕایەوە. عەبدالله کوڕی زوبەیر بریندار بو و خۆی فڕێدایە ناو بریندارەکان. ئەو دواتر باش بویەوە. وشترەکەیان کوشت. محەممەد کوڕی ئەبی بەکر عایشەی هەڵگرت و سەراپەردەیەکی بۆ هەڵکرد. عەلی لەسەر سەری عایشە وەستا و وتی: خەڵکت هاندا وئێستا بینیت هەمویان هەڵاتن. ئەوانت هەڵخراند تا یەکتر کوشتار بکەن. (عەلی قسەی زۆری لەگەڵ کرد).

عایشە وتی: سەروەریت پێبڕا، لێمان خۆشبە. خۆزگەم بەو ئەزمونەی خەڵك ئەزمونیان کرد.

عەلی ئەوی ڕەوانە کرد و دەستەیەك لەپیاوان و ژنانی کردە هاوڕێی و هەرچی دەویست پێی بەخشی و هەمو نیازەکانی بەراوەردە کرد.

## کوژراوەکانی شەڕی وشتر

من سەبارەت بەشەڕی وشتر تەنیا ئاماژەم بەگێڕانەوەی ئەبوجەعفەری تەبەریدا چونکە ئەو ڕاستگۆترین مێژوونوسانی مێژووە. خەڵکانی دیکە مێژووی خۆیان بەپێی خواستەکانی دڵی خۆیان لەگێڕانەوەکان پڕ کردوە.

لەناو کوژراوانی شەڕی وشتر دەتوانین ئاماژە بەم کەسانە بدەین: عەبدئەلرەحمان کوڕی عوبەیدالله برای تەڵحە (لەهاوەڵانی پێغەمبەر) عەمرۆ کوڕی عەبدالله کوڕی ئەبی قەیس کوڕی عامر کوڕی لۆئەی لەهاوەڵان، موحرەز کوڕی حارسە کوڕی ڕەبیعە کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی عەبد شەمس لەئەنسار کەعومەر ئەوی وەك فەرمانداری مەککە دەستنیشان کرد و دواتر لەسەر کار لایبرد. موعرێز کوڕی عێلاتی سەلەمی

برای حەجاج کوڕی عێلات کە لەناو سوپاکەی عەلیدا کوژرا، موجاشع کوڕی مەسعودی سەلەمی، مەجالد کوڕی مەسعود (هەردو لەناو سوپاکەی عایشە) هەردوك لەئەنسار کەموجاشع لەناو سوپاکەی عایشەدا کوژرا. عەبداللە کوڕی حەکیم کوڕی حەزامی ئەسەدی قورەشی هاوڕێ لەگەڵ عایشە کە لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنا، هند کوڕی ئەبی هالەی ئوسەیدی کەدایکی خەدیجە کچی خومیلد هاوسەری پێغەمبەر بو ولەناو سوپاکەی عەلیدابو و دەستەیەك وتویانە: لەبەسرە مرد بەڵام گێڕانەوەی یەکەم راستترە، هیلال کوڕی وەکیع کوڕی بشری تەمیمی لەئەنسار لەناو سوپاکەی عایشە و موعاز کوڕی عەفرا و براکەی مەعوەز کوڕی عەفرا کوڕەکانی حەرەس کوڕی رەفاعەی ئەنساری لەشەڕکەرانی بەدر و لەناو سوپاکەی عەلی. دەستەیەك دەڵێن: موعاز زیندو مایەوە و لەشەڕی (حوڕە) کوشتاری خەڵکی مەدینە بەفەرمانی یەزید کوڕی معاویە) کوژرا.

## ڕۆشتنی خەواریج بۆ سیستان

لەم ساڵەدا دوایی کۆتایی هاتنی شەڕی وشتر، حەسەکە کوڕی عەتابی حەبەتی و عێمران کوڕی فوزەیل بەرجمی لەگەڵ سواڵکەرانی عەرەب بەرێکەوتن و لەزالق لەشارەکانی سیستان دابەزین. خەڵکی ئەو شارە پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو. ئەوان لەوێ برێك سامانیان بەدەست هێنا و دواتر ڕۆشتنە زەرنج. فەرمانداری ئەوێ لێیان ترسا و بەئاشتی لەگەڵیان سازا و شاعێرەکەیان ئەمەی وت:

بشر سجستان بجوع و حرب بابن الفضيل و صعاليك العرب

لا فضة تغنيهم و لا ذهب

یانی: مژدەی برسیەتی و شەڕ بەسیستان بدە، بەکوڕەی فوزەیل و سواڵکەرانی عەرەب، ئەزێر سودیان پێدەبەخشێت ئەزیو.

عەلی عەبدولرەحمان کوڕی جەروی تایی بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد کەحەسەکە ئەوی کوشت. دواتر عەلی نامەی بۆ عەبداللە کوڕی عەباس نوسی و فەرمانی پێدا پیاوێك بۆ فەرمانداری سیستان دەستنیشان بکات و چوار هەزار پیاوی شەڕکەر لەگەڵ ئەودا رەوانە بکات. ئەو رەبعی کوڕی کاسی عەنبەری رەوانە کرد و حوصەین کوڕی

ئەبی حوڕی عەنبەری کردە هاوڕێی. کاتێك گەشتە ئەو سەرزەمینە، حەسەکە ڕوبەڕوی بویەوە و کوژرا و ڕەبعی دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینانەدا گرت.

فیروز حوصەینیان بە حوصەین کوڕی ئەبی حوڕ ناو دەبرد و ئەو سیستانی بو.

## کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە کوژرا. باوکی ئەبو حوزەیفە کوڕی عەتبە کوڕی ڕەبیعە کوڕی عەبد شەمس لەشەڕی یەمامە کوژرابو و کوڕەکەی خۆی محەممەدی بەجێهێشتبو. عوسمان کوڕی عەففان خەرجی ژیان و پەروەردە کردنی لەئەستۆ گرت و بەباشی پەروەردەی کرد و گەورەی کرد. لەناو ئەو بابەتانەی سەبارەت بەو وتراوە، ئەوە بو جارێك شەرابی خوارد و عوسمان بەقامچی لێیدا. دواتر محەممەد بوبەکەسێکی خۆپارێز و روی کردە پەرستینی خوا و داوای لەعوسمان کرد بیکاتە فەرمانداری ناوچەیەك.

عوسمان وتی: ئەگەر شیاو بویتایە، ئەو کارەم بەتۆ دەسپارد.

وتی: حەز لەشەڕ کردن لەدەریا دەکەم، فەرمانێکم پێ بدە تا بڕۆمە میسر. عوسمان فەرمانی پێدا وساز وبەرگ و توێشو و کەرەستەی شەڕی پێبەخشی. کاتێك گەیشتە میسر، خەڵك خۆپارێزی ئەویان بینی و پەیوەستی بون و ئەویان بەگەورە زانی. ئەو هاوڕێ لەگەڵ عەبداللە کوڕی سەعد بۆ شەڕی صەواری ڕۆیشت.

محەممەد ئەوی سەرکۆنەدەکرد و عوسمانی بۆ هێنانە سەر کاری ئەو زیاتر سەرکۆنە دەکرد. دەیوت: عوسمان پیاوێکی هێناوتە سەر کار پێغەمبەر کوشتنی ئەوی بەرەوا زانیوە. عەبداللە نامەی بۆ عوسمان نوسی کە: محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر، شارەکانیان لەمن ناخۆش کردوە.

عوسمان بۆ عەبداللەی نوسی: کوڕی ئەبوبەکر، دەبێت بەباوکی و بەخوشکەکەی عایشەی ببەخشیت، بەڵام کوڕی حوزەیفە، ئەو کوڕی من و کوڕی برای من و پەروەردەی من و بێچوی قوڕەیشە.

عەبداللە نوسی: ئەم بێچوە پەڕ و باڵی دەرکردوە و جگە لەفڕین هیچ کارێك نەماوەتەوە.

عوسمان بۆ کوڕی ئەبو حوزەیفە سی هەزار درەم و وشترێکی بەباری گرانبایی ڕەوانە کرد. محەممەد ئەم دیاریەی بردە مزگەوت و لەبەرابەر خەڵك داینا و هاواری کرد: ئەی موسوڵمانان، سەیری عوسمان بکەن دەیەوێت بەفریو لەدین دورم بخاتەوە و بەرتیل بەمن بدات.

خەڵکی میسر زیاتر وەسفیان کرد وسەرکۆنەی عوسمانیان کرد. بۆ سەروەری بەیعەتیان لەگەڵ کرد. عوسمان نامەی بۆ نوسی وچاکە وسەرپەرەستی کردن و پەروەردە کردن و هەوڵەکانی خۆی بۆ بەراوەردە کردنی نیازەکانی، بیرخستەوە. لەنامەکەدا نوسی: تۆ لەبەرابەر چاکەکاریەکانی من ناسوپاسیت کرد و ئەمە لەکاتێکدا من زیاتر لەجاران پێویستم بەسوپاس کردنی تۆ هەیە. ئەم کارە ئەبوە ڕێگر لەوەی محەممەد دەست لەسەرکۆنە کردنی عوسمان و هاندانی خەڵك دژی ئەو هەڵبگرێت. ئەو بەردەوام خەڵکی ناچار دەکرد تا بڕۆنە مەدینە و گەمارۆی عوسمان بدەن. هەر کەس دەیویست ئەم کارە بکات کوڕی ئەبی حوزەیفە هاوکاری دەکرد.

کاتێك میسریەکان بۆ سڕینەوەی عوسمان لەم ولآتە ڕۆشتنەدەر، محەممەد لەوێ مایەوە و عەبداللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لەمیسر ڕۆشتەدەر. کوڕی حوزەیفە بەسەر ولآتدا زاڵبو و دەستی بەسەردا گرت و لەوێ مایەوە تا عوسمان کوژرا و خەڵك لەگەڵ عەلی بەیعەتیان کرد. معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و عەمرۆ کوڕی عاص بۆ دژایەتی کردنی ئەو ڕێککەوتن. عەمرۆ عاص پێش ئەوەی قەیس کوڕی سەعد وەك فەرمانداری میسر لەلایەن عەلیەوە بگاتە ئەوێ، بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوت. ئەو محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفەی فریودا تا لەوێ هاورێ لەگەڵ هەزار کەس لەهاوەڵانی خۆی هاتەدەر و لەعەریش لەناو قەڵاکاندا سەنگەریان گرت. عەمرۆ کوڕی عاص کەشکەنجیری (بەرد هاوێژ) بۆ دانا تا ئەوەی محەممەد لەگەڵ سی لەهاوەڵانی کوژرا.

ئەم گێڕانەوەیە ڕاست نیە چونکە عەلی لەسەرەتای خەلافەتی خۆی، قەیسی وەك فەرمانداری میسر دەستنیشان کرد. ئەگەر معاویە و عەمرۆ پێش هاتنی قەیس محەممەدیان کوشتبێت، دەستیان بەسەر میسردا دەگرت چونکە هیچ کەس گومانی نیە زاڵبونی معاویە و عەمرۆ بەسەر میسر دوای شەڕی صەفین بو. و خوا زاناترە.

گێرانەوەیەکی دیکەیش هەیە بەمشێوەیە کەمحەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە میسریەکانی بۆ شەڕ لەگەڵ عوسمان ڕەوانە دەکرد. کاتێك خەڵك گەمارۆیاندا، محەممەد عەبدالله کوڕی سەعدی لەمیسر دەرکرد. ئەو فەرمانداری عوسمان بو. محەممەد بەسەر میسردا زاڵبو. عەبدالله لەسنورەکانی میسر دابەزی و چاوەڕوانی ئەنجامی کاری عوسمانی دەکرد. ڕۆژێك سواریەك لای ئەو دەرکەوت. عەبدالله پرسیاری لێکرد و سوار پێی وت عوسمان کوژراوە. عەبدالله ئایەتی مەرگی خوێند (هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە) (بقرە/٢/١٥٦) عەبدالله پرسی: خەڵك دوای ئەو چیان کرد.

سوار وتی: لەگەڵ عەلی بەیعەتیان کرد.

عەبدالله ئایەتی مەرگی خوێند.

سوار وتی: گومان دەکەم هاتنە سەر کاری عەلی لای تۆ بەرابەرە لەگەڵ کوژرانی عوسمان.

وتی: بەڵێ.

وتی: گومان دەکەم عەبدالله کوڕی سەعد بیت.

وتی: بەڵێ.

سوار پێی وت: ئەگەر هیوات بەخۆت هەیە، رابکە، رابکە. بۆچونی عەلی سەبارەت بەئێوە ئەوەیە ئەگەر بەردەستی بکەون کوشتارتان دەکات یا بۆ شوێنە دورەکان دورتان دەخاتەوە.

ئێستا فەرماندار بەدوای مندا دێت.

وتی: کێیە؟

وتی: قەیس کوڕی سەعد کوڕی عبادە.

عەبدالله کوڕی سەعد وتی: خوا محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە دور بخاتەوە چونکە ستەمی لەکوڕە مامەکەی خۆی کرد وخەڵکی دژی ئەو هاندا لەگەڵ ئەوەی عوسمان سەرپەرەستی ئەوی گرتە ئەستۆ و پەروەردەی کرد. بەڵام محەممەد چاکیەکانی ئەوی بەخراپە وەڵام دایەوە و خەڵکی دژی ئەو هەڵخراند تا کوشتیان. دواتر عەلی کەسێکی وەك فەرمانداری میسر دەست نیشان کرد کە لەو(محەممەد کوڕی

ئەبی حوزەیفە) و لەعوسمان هەرچی زیاتر دوربو. ئە تەنانەت یەك مانگ فەرمانڕەوایی سەرزەمینەکەی خۆی پێ نەبەخشی چونکە بەشیاوی نەدەزانی. عەبداللە رایکرد و ڕۆشتە لای معاویە.

ئەم گێڕانەوەیە رونی دەکاتەوە کاتێك قەیس بو بەفەرمانڕەوایی میسر، محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە زیندو بو. راستیەکەی ئەمەیە.

دەستەیەك دەڵێن: عەمرۆ کوڕی عاص دوای شەڕی صەفین بەرەو میسر بەرێکەوت. محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە روبەروی بویەوە و سوپایەکی بۆ شەڕ رازاندەوە. کاتێك عەمرۆ فراوانی سوپاکەی ئەوی بینی، پەیك و پەیامی بۆ لای ئەونارد و ئەم دوانە چاویان بەیەك کەوت و کۆبونەوە. عەمرۆ پێی وت: هەندێ پێشهات رویداوە و لێیان ئاگادریت و من لەگەڵ معاویە بەیعەتم کردوە. بەڵام لەزۆر لەکارەکانی ئەو نارازیم وبەباشی دەزانم رێبەرەکەی تۆ عەلی لەمعاویە لەپێشترە و گیانێکی پاکتر وپێشینەیەکی باشتری هەیە وبۆ ئەم کارە شیاوترە. شوێنێك دیاری بکە تا بێ سوپا بتوانم تۆ ببینم. تۆ لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر وەرە و من لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر. شمشێرەکان هەموی لەکاڵاندا بێت. ئەم دوانە لەسەر ئەم کارە پەیمانیان بەست و رێککەوتن وعەریشیان بۆ شوێنی کۆبونەوە دیاری کرد. عەمرۆ بۆ لای معاویە گەڕایەوە و لەچۆنیەتی کارەکان ئاگاداری کردەوە. کاتێك، کاتی دیاریکراو گەیشت، هەر کام بەسەد پیاوی شەڕکەر روی کردە عەریش. عەمرۆ سوپایەك لەپشت سەریەوە بو تا چاودێری بکات. کاتێك لەعەریش چاویان بەیەك کەوت، سوپای عەمرۆ گەیشت و محەممەد زانی فێڵیان لێ کردوە. ڕۆشتە ناو کۆشکی عەریش و لەوێ سەنگەری گرت. عەمرۆ گەمارۆیدا و بەبەرد هاوێژ، بەردبارانی کرد تا محەممەد گرفتار بو. عەمرۆ ئەوی رەوانەی لای معاویە کرد و معاویە خستیە زیندان. کچی قەرەزە هاوسەری معاویە، کچە مامی محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە بو و دایکی ئەم ژنە فاتیمە کچی عەتەبە. ژن خواردنی بۆ دروست دەکرد وبۆی دەنارد. رۆژێك لەگەڵ خواردنەکان ئاسنبڕی بۆ نارد و محەممەد زنجیرەکانی خۆی بڕی و هەڵات و خۆی داشارد و پەنای بردە بەر ئەشکەوتێك. ئەویان گرت و کوشتیان. و خوا زاناترە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەزیندان مایەوە تا حجر کوڕی عودەی کوژرا. دواتر هەڵات.

مالك كوڕی هوبەیرەی سەكونی بەدوایدا گەڕا و ئەوی لەتۆڵەی حجردا كوشت. مالك لای معاویە بوبەناوبژیوان تا حجر نەكوژێت بەڵام معاویە بەناوبژیوانی ئەو رازی نەبو.

دەستەیەك دەڵێن: كاتێك محەممەد كوڕی ئەبی بەكر كوژرا، محەممەد كوڕی ئەبی حوزەیفە لەگەڵ دەستەیەكی فراوان روی كردە عەمرۆ عاص ونەمانی پێبەخشین و دواتر خیانەتی لێكردن و رەوانەی فەلەستینی كردن بۆ لای معاویە و معاویە خستیە زیندانەوە. محەممەد هەڵات و معاویە لەبەرچاوی خەڵك وای نیشاندا هەڵاتنی ئەوی پەسەند نەكردوە. لەبەر ئەمە فەرمانیدا بەدوایدا بگەڕێن. عوبەیدالله كوڕی عەمرۆ كوڕی زولامی خەسعەمی شوێنی كەوت و ئەوی لەحوران لەناو ئەشكەوتێك گرت. چەندین كەرەكێوی هاتن تا برۆنە ناو ئەشكەوتەكە بەڵام كاتێك محەممەدیان بینی، ڕەمیان كرد. كەسانێك لەوێ سەرقاڵی دروێنە كردن بون. وتیان: ڕەم كردنی ئەم كەرەكێویانە هۆكارێكی هەیە. ڕۆشتنە ناو ئەشكەوتەكە و محەممەدیان بینی و هاتنەدەر. عوبەیدالله چاوی بەوان كەوت و پرسیاری محەممەدی كرد و تایبەتمەندیەكانی ئەوی باس كرد. وتیان: لەناو ئەشكەوتەكەدایە. ئەو محەممەدی هێنایە دەر و نەیویست بیباتە لای معاویە تا ئازادی بكات. لەبەر ئەمە سەری بڕی. محەممەد كوڕی خاڵی معاویە بو.

## فەرمانداری قەیس كوڕی سەعد لەمیسر

لەمانگی صەفەری ئەم ساڵە /نوتی ٦٥٦ زایینی، عەلی قەیس كوڕی سەعدی وەك فەرمانداری میسر رەوانە كرد. ئەو ئاڵاهەڵگری ئەنسار لای پێغەمبەر بو. پیاوێكی راست كردار و بوێر لەقەڵەم دەدرا. پێی فەرمو: بەرەو میسر بەرێكەوە چونكە من تۆم وەك فەرمانداری ئەو ناوچە دەست نیشان كردوە. برۆ ماڵ و هاورێ نزیك و بەهێزەكانی خۆت هەر كەسێك دەتەوێت هاورێیەتیت بكات، هەڵیانگرە و لەگەڵ سوپاكە بەرێكەوە چونكە ئەم كارە ترسێكی زیاتر لای دوژمنان دروست دەكات و هاورێكانی تۆ رێزدارتر دەكات. بەچاكەكاری فەرمان بدە و سەرسەختی لەگەڵ خراپەكاران بكە و لەگەڵ كۆمەڵانی خەڵك بەنەرمی هەڵس و كەوت بكە چونكە

نەرمی نواندن دواهاتی باشی بەدواوە دێت.

قەیس وتی: ئەوەی وتت هاورێ لەگەڵ سوپا بڕۆم، ئەگەر ئەم کارە پەیوەست بێت بەوەی لەگەڵ خۆم لەشکرێك لەمەدینە بۆ ئەوێ ببەم، هیچ کات ئەو کارە ناکەم بەڵکو ئەم سوپایە بۆ تۆ بەجێدێڵم تا ئەگەر نیازت پێی بو، لەنزیك تۆدابێت و ئەگەر مەبەستت کرد بەرەو سەرزەمینێکی رەوانە بکەیت هۆکارێك بۆ بەهێزی تۆ بێت.
قەیس لەگەڵ حەوت کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر بەرێکەوت و بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا، ڕۆشتە ناو میسر. ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و فەرمانیدا نامەی سەروەری باوەڕداران سەبارەت بەفەرمانداری ئەو بخوێننەوە. لەنامەکە داوا لەخەڵك کرابو بەیعەتی لەگەڵدا بکەن و هاوکاری بکەن و بۆ گەیشتن بەراستی و دروستی هاریکاری بن. دواتر قەیس دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: سوپاس بۆ خوایەك راستی و دروستی نیشاندایین و خراپی و خواری لەناوبرد و ستەمکارانی لەجێگەی خۆیان دامرکاندەوە. ئەی خەڵکینە، ئێمە لەگەڵ باشترین کەس لەدوای پێغەمبەر بەیعەتمان کردوە، هەستن ئەی خەڵکینە و لەسەر بنەمای نوسراوی خوا وشێوازی پێغەمبەر بەیعەتی لەگەڵ بکەن. ئەگەر لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵ ئێوەدا هەڵس کەوت نەکەین، هیچ بەیعەتێکمان لەئەستۆی ئێوەدا نیە.

خەڵك بەیعەتیان کرد و کاروباری میسر سامان درا. ئەو کارگوزراەکانی خۆی بۆ سەراسەری میسر رەوانە کرد جگە لەشارێك بەناوی خەرنبا کە خەڵکەکەی کوژرانی عوسمانیان بەگەورە زانی. فەرماندارەکەی ئەوان پیاوێك لەکەنانە لەبەنی مەدلەج بەناوی یەزید کوڕی حەرەس بو. ئەو کەسی بۆ لای قەیس نارد و داوای خوێنی عوسمانی کرد. موسلیمە کوڕی موخەلدیش داوای خوێنی عوسمانی دەکرد. قەیس پەیامی بۆ نارد: هاوار لەتۆ، ئایا دەتەوێت دژی من شۆڕش بکەیت! سوێند بەخوا حەز ناکەم پاشایەتی میسر وشامم هەبێت ودەستم بەخوێنی تۆ پیس ببێت.

موسلیمە پەیامی ناردەوە کە: تا ئەو کاتەی تۆ فەرمانڕەوایی میسریت، وازت لێ دێنم.

قەیس پیاوێکی دورئەندێش و بیرمەند بو، پەیامی بۆ خەڵکی خەرنبا رەوانە کرد کەنامەوێت ئێوە بەزۆر ناچار بەبەیعەت بکەم ولەبەر ئەمە کارم بەئێوە نیە.

شێوازێکی جیاواز وئاسانی لەگەڵ ئەوان گرتە بەر و هەمو باجەکانی کۆکردەوە و کەس دژایەتی نەکرد. عەلی کوڕی ئەبی تالب بۆ شەڕی وشتر ڕۆشتەدەر و گەڕایەوە و قەیس بەهەمان شێوە فەرمانڕەوا بو. ئەو دژوارترین پیاو بۆ معاویە بو چونکە لەنزیك شامەوە جێگیر بو و معاویە بەردەوام لەوە دەترسا عەلی لەگەڵ عێراقیەکان و قەیس لەگەڵ میسریەکان بێن و گەمارۆی بخەنەسەر. معاویە بۆ قەیسی نوسی:

سڵاو لەتۆ. ئێوە ڕەخنەتان لەعوسمان گرت بەقامچی لەپیاوێکی دا یا جوێنی بەیەکێکیتردا یاگەنجێکی بێ ئەزمونی کردە فەرمانڕەوا. بەڵام هەموان دەتانزانی ڕشتنی خوێنی ئەو ناڕەوایە. کارێکی قورستان کرد و گوناحێکی گەورەتان لێوەشایەوە. ئەی قەیس تۆبە بکە چونکە تۆ لەناو ئەو کەسانەیت خەڵکت دژی عوسمان هاندەدا. بەڵام سەرومری تۆ، ئێستا بەراستی و دروستی وبێ گومان زانیم ئەو بو خەڵکی دژی عوسمان هان دەدا و ئەوانی ناچار کرد بیکوژن. ئاگادار بەگەورەیی پێگەی خەڵکەکەت ئەبو تۆی لەگرفتاری تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان ڕزگار کرد. ئەی قەیس ئەگەر دەتوانیت لەتۆڵەستێنەکانی خوێنی عوسمان بیت، ئەو کارە بکە و لەبەرابەردا پاشایەتی دو عێراق (بەسرە و کوفە) دوای ئەوەی سەرکەوتم، بەتۆ دەبەخشم و تا ئەو کاتەی زیندوم تۆ لەپۆستەکەت دەهێڵمەوە. هەر کەس لەخزمەکانت دەوێت، بۆ فەرمانڕەوایی حیجاز دەست نیشان بکە و تا زیندوم پارێزگاری لێدەکەم. هەرچیت دەوێت لەمنی داوابکە و بۆچونی خۆتم بۆ بنوسە.

کاتێك نامەی معاویەی پێگەیشت، قەیس کەپیاوێکی فرمزان بو، نەیویست لەمەبەستی خۆی ئاگاداری بکاتەوە بەڵکو ئاهەنگی ئەوەی کرد بەنەرمی و لەرێگەی فێڵ لەسەر کار لایببات و بۆچونی خۆی بۆ ئەو ئاشکرا نەکات و لەشەڕ دژی ئەو پەلە نەکات. قەیس نامەی بۆ معاویە نوسی: دوای سڵاوی خوا، ئەوەی سەبارەت بەکوشتنی عوسمان ئاماژەت پێدا، تێگەیشتم. ئەمە کارێك بو تیایدا بەشدار نەبوم. ئاماژەت بەوەدا ڕێبەرەکەی من خەڵکی دژی ئەو هاندەدا و ئەویان کوشت. لەم بابەتەیش بێ ئاگام. هەروەها باسی ئەوەت کرد زۆربەی خەڵکەکەی من دەستیان بەخوێنی عوسمان پیس بوە و یەکەم کەسەکان کەبەم کارە هەستاون، خزم و کەس و کاری من بون. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەلایەنگیری کردنی من لەخۆت ئاماژەت پێدا، بابەتێکە دەبێت

تێفکرین و ئەندێشەی بۆ بکەم وناتوانم ئەم کارە بەخێرایی ئەنجام بدەم. من کارم بەتۆنیە و هیچ زیانێك لەلایەن منەوە بەتۆ ناگات تا تۆیش لەکارەکانی خۆت وردببیتەوە و منیش بەهەمان شێوە.

کاتێك معاویە نامەکەی خوێندەوە، ئەوی بەکەسێکی نزیکبوی دورەپەرێز هاتەبەرچاو و لەبەر ئەمە نوسی:

دوای سڵاو، نامەکەی تۆم خوێندەوە، نەبینیم ئاهەنگی نزیك کەوتنەوەت هەیە تا تۆ بەپشتیوان و ئاشتیخواز بزانم و نەئاهەنگی دورکەوتنەوە تا بەدوژمن لەقەڵەمت بدەم. وەك من کەسێکی فێڵباز فریو ناخوات و لەداودا گیر ناکەوێت چونکە سوپایەکی فراوانم لەگەڵدایە و جڵەوی هەزاران ئەسپم لەدەستایە. سڵاو و ماڵئاوایی.

کاتێك قەیس نامەکەی خوێندەوە، زانی نەرمی و نەرمی نواندن رێگەچارە نیە، ئەوەی لەدڵیدا بو، نوسی و وتی: دوای سڵاو، سەرمسوڕماوە لەشەیدا بونی تۆ بۆمن و تەماحکار بونی تۆ بۆ فریودانی من و ئارەزوی تۆ بۆ لەناو بردنی من. ئایا داوای ئەوەم لێ دەکەیت لەژێر فەرمانی کەسێك بێمەدەر شیاوترینی خەڵکان بۆ فەرمانڕەوایی و بوێرترینیان بۆ وتنی راستی و دروستی و نزیکترینیان لەپێغەمبەری خوایە! داوا دەکەیت بێمە ژێر فەرمانی تۆ، فەرمانی نەشیاوترین کەس بۆ فەرمانڕەوایی و بوێرترینیان بۆ وتنی ناراست و گومڕاترینیان لەرێگەی راست و دورترینیان لەپێغەمبەر، زادەی خەڵکێکی گومڕا و گومڕاکەر، یاخیەك لەیاخیەکانی دێو! بەڵام ئەوەی وتت میسر لێوانلێو دەکەیت لەپیادە وسوارە بۆ لەناو بردنی من، سوێند بەخوا ئەگەر بەخۆتەوە سەرقاڵت نەکەم تا لەبیری رزگاری خۆتا بیت، پیاوێکی زۆر بەختەوەریت. سڵاو و ماڵئاوا.

کاتێك معاویە نامەکەی خوێندەوە، هیوابڕاو بو و پێگەی قەیس بەمەترسیدار هاتە بەرچاوی و زانی فێڵ و فریو کاریگەری لەسەر ئەو دانانێت. لەبەر ئەمە لەرێگەی عەلیەوە دەستی بەفریودانی ئەو کرد و بەخەڵکانی شامی وت: جوێن بەقەیس کوڕی سەعد مەدەن و بانگەوازی شەڕ دژی ئەو مەکەن چونکە ئەو چاکەخوازی ئێمە و بەنهێنی نامەکانی بەدەستی ئێمە دەگات و نیشانی دەدات شوێنکەوتنی ئێمەی هەڵبژاردوە. مەگەر نابینن لەگەڵ براکانتان لەخەرنبا کە لەژێر فەرمانی ئەودان، چ

هەڵس و کەوتێکی گرتۆتەبەر. بەخشش و رۆژی ئەوان بەوان دەبەخشێت و چاکەی فراوانیان لەگەڵ دەکات. ئەو نامەیەکی درۆینەی لەزمانی قەیسەوە نوسی کەداوای خوێنی عوسمانی دەکرد و دەیوت هاورێ لەگەڵ ئەو (معاویە) بەم کارە هەڵدەستێت. ئەو نامە درۆینەکەی بۆ خەڵکانی شام خوێندەوە.

ئەم هەواڵانە بەعەلی گەیشت. محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبی تالب ئەم هەواڵانەیان پێگەیاند و هەواڵنێرەکانیان لەشام ئەوانی ئاگادار کردبویەوە. عەلی ئەم کارەی بەدژوار زانی و دوکوڕەکەی حەسەن و حسێن و عەبدالله کوڕی حەعفەری بانگ کرد و لەپێشهاتەکان ئاگاداری کردنەوە.

کوڕی جەعفەر وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران، ئەوەی دەبێتە هۆکاری دروست بونی گومان لای تۆ، بەوەی نابێتە هۆکاری دروست بونی گومان، بسپێرە. قەیس لەفەرمانڕەوایەتی میسر لاببە.

عەلی وتی: سوێند بەخوا باوەڕ بەم قسانە ناکەم.

عەبدالله وتی: ئەو لەسەر کار لابەرە ئەگەر ئەم هەواڵانە راست بێت، بەفەرمانەکەی تۆ رازی نابێت. ئەوان لەم بگرە وبێنەدابون کەنامەی قەیس گەیشت و عەلی ئاگادار کردەوە کەدەستەیەك خۆیان لەو بەدور گرتوە وئەو شەڕی لەگەڵ ئەوان نەکردوە.

عەبدالله وتی: ئەوەی نیگەرانم دەکات، ئەوەیە ئەم کارە لەبەر رێککەوتنی لەگەڵ ئەم خراپەکارانەدا بێت. فەرمانی پێبدە شەڕی ئەوان دەست پێبکات. کاتێك قەیس نامەکەی خوێندەوە، لەوەڵامدا نوسی: دوای سڵاو، لەکارەکەی تۆ سەرمسوڕماوە چونکە بۆ شەڕی کەسانێك رەوانەم دەکەیت، دەستبەرداری تۆبون و تۆیان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنەکانت ئاسودە کردوە! ئەگەر زەخت لەوان بکەین، دوژمنەکانت بەزیانی تۆ هاوکاریان دەکەن. ئەی سەرومری باوەڕداران، گوێ لەئامۆژگاریەکانی من بگرە و دەست لەوان هەڵگرە چونکە ئەمە بۆچونی راستە. سڵاو و ماڵئاوا. کاتێك عەلی نامەکەی خوێندەوە، عەبدالله کوڕی جەعفەر وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران محەممەد کوڕی ئەبی بەکر وەك فەرمانداری میسر دەستنیشان بکە و قەیس لەسەر کارەکەی لاببە چونکە بیستومە قەیس دەڵێت: ئەو گرفتەی بەکوشتنی موسلیمە کوڕی

موخەلەد چارەسەر دەکرێت، فەرمانڕەواییەکی قێزەون و ستەمکارانەیە.

عەبدالله کوڕی جەعفەر لەدایکەوە برای محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بو. عەلی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر یانەشتەری ئەخەعی رەوانەی میسر کرد. ئەشتەر لەرێگادا مرد و ئەو محەممەدی رەوانە کرد. محەممەد لەمیسر ڕۆشتە لای قەیس.

قەیس وتی: سەرومری باوەڕداران چی بەسەر دێت؟ چ شتێك ئەوی گۆڕیوە؟ ئایا کەسێك کەوتۆتە نێوان ئێمە و ئەو؟

محەممەد وتی: بەمشێوە نیە و فەرمانڕەوایی تایبەتە بەتۆ.

قەیس وتی: نا، سوێند بەخوا نامێنمەوە. ئەو لەمیسر هاتەدەر وبەرەو مەدینەبەرێکەوت و لەبەر ئەوەی لەسەر کار لایان بردبو، توڕە بو. حسان کوڕی سابت کەپیاوێکی عوسمان پەرست بو، ڕۆشتە لای وپێی وت: عوسمانت کوشت و عەلی تۆی لەسەر کار لابرد. گوناحەکە بۆ تۆمایەوە و کەس سوپاسی نەکردی.

قەیس پێی وت: ئەی دڵ کوێری چاو کوێر! سوێند بەخوا ئەگەر لەترسی شەڕی نێوان بنەماڵەکەی من و بنەماڵەکەی تۆ نەدەبو، دەمکوشتی! لای من بڕۆ. دواتر مەروان کوڕی حەکەم قەیسی لەمەدینە ترساند و لەبەر ئەمە لەگەڵ سەهل کوڕی حەنیف ڕۆشتە لای عەلی و هەردوك لەشەڕی صەفین شان بەشانی عەلی شەڕیان کرد.

معاویە نامەی بۆ مەروان کوڕی حەکەم نوسی و سەرکۆنەی کرد چونکە قەیسی بەزیندویی هێشتۆتەوە. لەنامەکەدا نوسی: ئەگەر سەد هەزار پیاوی شەڕکەرت بۆ هاوکاری عەلی رەوانە دەکرد، لای من ئاسانتربو لەهاوکاری کردنی قەیس بۆ عەلی بەو هەمو فرەزانیەوە.

کاتێك قەیس ڕۆشتە لای عەلی و لەروداوەکان ئاگاداری کردەوە، عەلی زانی لەگەڵ چ لافاوێکی کێوناسا لەگوشار و فێڵ و فریو روبەروە. لەم لاوە هەواڵی کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بەوان گەیشت و پێگەی قەیس لای عەلی زیادی کرد و لەهەمو کارەکان فەرمانی لێدەبرد و راوێژی لەگەڵ دەکرد. کاتێك محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ڕۆشتە میسر، نامەی عەلی بۆ میسریەکان خوێندەوە و وتی:

سوپاس بۆ خوا کەئێمە و ئێوەی بۆ راستی ودروستی رێنوێنی کرد و بوە هۆی سەرگەردانی و ناسازگاری کەسانیتر و بۆ ئێمە و ئێوە زۆر لەپرسەکانی ئاشکرا کرد و

نەزانەکانم لەبینینی کوێر بون. عەلی کوڕی ئەبی تالب سەرپەرستی کاروباری ئێوەی بەمن سپاردوە. بەختەوەری من تەنیا بەخوایە، کاری خۆم بەو دەسپێرم وروودەکەمە دەرگای ئەو و تەنیا لەو دەپارێمەوە. ئەگەر ئەوەی لەفەرمانڕەوایی من و کارەکانی من دەیبینن، بەئاقاری فەرمانبەری خوا بێت، سوپاسی خوا بکەن چونکە ئەو رێنوێنی کردوین. ئەگەر کارگوزارێك لەکارگوزارەکانی منتان بینی لەسەر بنەمای راستی و دروستی کردەوەکانی ئەنجام نادات، بەمنی بڵێن و بۆ ئەم کارە سەرکۆنەم بکەن چونکە بەم شێوە بەختەوەرترم وئێوە بۆ ئەم کردارە شیاون. خوا بەبەزەیی و خۆشەویستی خۆی ئێمە بۆ کارە چاکەکان رێنوێنی بکات.

دواتر دابەزی و بۆ ماوەی یەك مانگ چاوەڕێی کرد و دواتر کەسی بۆ لای دورەپەرێزەکان نارد کەقەیس بەئاشتی لەگەڵ ئەوان بەسەری برد. پێی وتن: یا وەرنە ژێر فەرمانی ئێمە، یا لەم وڵاتە بڕۆنەدەر.

ئەوان وەڵامیان دایەوە: ئەو کارە ناکەین، مۆڵەتمان پێبدە تا لەکاروباری خۆمان ورد ببینەوە و بزانین پێشهاتەکان بەرە کوێمان دەبەن، لەشەڕ کردن دژی ئێمە پەلە مەکە.

محەممەد بەپێشنیارەکەی ئەوان رازی نەبو. ئەوان لەقەڵاکاندا خۆیان داشارد و بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد. شەڕی صەفین رویدا و ئەوان بەهەمان شێوە لەترسی محەممەد ژیانیان بەسەر دەبرد.

کاتێك عەلی لەشەڕی معاویە گەڕایەوە و جەنگ بەداوەری کۆتایی هات، هیوایی ئەوەیان برد محەممەد لەناو ببەن و لەبەر ئەمە دوژمنایەتی خۆیان لەگەڵ ئەو ئاشکرا کرد. محەممەد، حەرەس کوڕی جومهانی جوعفی رەوانەی شەڕی خەڵکی خەرەنبا کرد و لەوێ یەزید کوڕی حەرەس لەگەڵ بەنی کەنانە و هاورێکانی خۆی ژیانی بەسەر دەبرد. ئەو شەری لەگەڵ ئەوان دەسپێکرد وئەوان خۆڕاگریان کرد و ئەویان کوشت. دوبارە محەممەد کوڕی مەزاهیمی کەلبی رەوانە کرد و ئەویشیان کوشت.

دەستەیەك دەڵێم: محەممەد و معاویە نامەیان بۆ یەکتر دەنارد. من ئاماژەدان بەو بابەتەم پەسەند نەکرد چونکە ئەمە لەو بابەتانەیە کۆمەڵانی خەڵك باوەری پێناکەن.

هەروەها لەم ساڵەدا، ئەبراز فەرمانداری مەرو، دوای شەڕی وشتر ڕۆشتە لای عەلی

و بەناشتی رازی بو. عەلی بەودا نامەیەکی بۆ ئەسواران و خەڵکانی مەرو نارد. دواتر ئەوان لەئایین هەڵگەرانەوە و لەنەیشابور سەنگەریان گرت و ڕێگەیان بەست. عەلی، خولەید کوڕی قورەی لەگەڵ ئیبن تەریفی یەربوعی رەوانەی خوراسان کرد.

## هاتنی عەمرۆ کوڕی عاص بۆ لای معاویە کوڕی ئەبی سوفیان

شوێنکەوتنی معاویە

دەستەیەك دەڵێن: عەمرۆ کوڕی عاص پێش کوژرانی عوسمان لەمەدینە ڕۆشتەدەر و ناهەنگی فەلەستینی کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك گەمارۆیان خستە سەر عوسمان، وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، هەرکەس لەم شارەدا بمێنێتەوە و لەکاتی کوژرانی ئەو لەم شارەدا بێت، خوا ریسوایی دەکات. هەرکەس توانایی هاوکاری کردنی ئەوی نیە، هەڵێت. لەبەر ئەمە ڕۆشت و بەرێکەوت. ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. هاورێ لەگەڵ کوڕەکانی عەبدالله و محەممەد بەرێکەوتن. لەفەلەستین مایەوە.

سوارەیەك لەمەدینە لای ئەو تێپەڕی کرد و محەممەد لێی پرسی: ناوت چیە؟ وتی: حوصەیرە. عەمرۆ وتی: عوسمانیان گەمارۆداوە! چ هەواڵێکت پێیە؟ وتی: کاتێك عوسمان گەمارۆدرابو، بەجێم هێشت.

دوای چەند رۆژ سوارەیەکیتر هات، عەمرۆ لێی پرسی: ناوت چیە؟ وتی: قەتال (پیاوکوژ). عەمرۆ وتی: عوسمانیان کوشت! چ هەواڵێکت پێیە؟ وتی: عوسمان کوژرا و تا ئەو کاتەی لەمەدینە بون، هیچ کارێك ئەنجام نەدرا.

دواتر سوارەیەکیتر لەمەدینەوە هات، عەمرۆ لێی پرسی: ناوت چیە؟ وتی: حەرب (شەڕ). عەمرۆ وتی: بەناچاری چەندین شەڕی سەراسەری رودەدات. عەمرۆ پێی وت: چ هەواڵێکت پێیە؟ پیاو وتی: لەگەڵ عەلی بەیعەتیان کرد.

سەلەم کوڕی زێنباع وتی: لەنێوان ئێمە و ئێوە دەرگایەکی پارێزەر بو و شکا، بەدوای دەرگایەکی دیکەدا بگەڕێن. عەمرۆ وتی: ئێمەیش بەدوایدا دەگەڕێین. عەمرۆ لەگەڵ دو کوڕەکەی بەرێکەوت و هاوشێوەی ژنان دەستی بەشین و ڕۆڕۆ کرد و بەردەوام دەیوت: ئای هاوار لەعوسمان! هەواڵی مەرگی شەرم و ئایین بەئێوە دەدەم!

سەرئەنجام ڕۆشتە دەمەشق. ئەو پێشتر دەیزانی چی ڕودەدات و لەسەر بنەمای ئەوە هەڵس وکەوتی دەکرد.

داستانەکە بەمشێوە بو کەپێغەمبەر ئەوی بۆ عەممان رەوانە کرد و ئەو لەزانا جولەکەکان هەندێ شتی بیستبو کەبەڵگەکانی ناسیەوە. سەبارەت بەچارەنوسی پێغەمبەر لەو زانایە پرسیاری کرد و ئەوەی دوای ئەو، چ کەسێك دێتە سەر کار. زانا ئاگاداری کردەوە کەدوای ئەو ئەبوبەکر دێتە سەر کار و رۆژگاری کورت دەبێت. دواتر پیاوێك لەخەڵکەکەی خۆی هاوشێوەی خۆی دێتە سەر کار و رۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەو درێژە دەکێشێت و سەرئەنجام بەشێوەیەکی لەناکاو دەکوژرێت. دوای ئەو پیاوێك دەبێتە فەرمانڕەوا کەرۆژگاری خەلافەتی دەخایەنێت و لەبەرچاوی هەموان خوێنی دەرێژن. دوای ئەو پیاوێك کاروبارەکان دەگرێتە دەست و خەڵك دەوری دەگرن و شەڕێکی گەورە ڕودەدات بەڵام پێش ئەوەی هەموان بەیعەتی لەگەڵدا بکەن، دەکوژرێت. دوای ئەو فەرمانڕەوایی سەرزەمینی پیرۆز دێتە سەر تەخت و پاشایەتیەکەی رۆژگارێکی درێژ دەخایەنێت و شوێنکەوتوانی ئەم ئایینە تەسلیم و گوێرایەڵی ئەو دەبن. ئەو یەکراست دەکەوێتە جەهەننەم.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك هەواڵی کوژرانی عوسمان بەعەمرۆ کوڕی عاص گەیشت، وتی: من باوکی عەبداللەم. من کوشتم ئەو کاتەی لەدۆڵی وەحشیەکان بوم ئەگەر تەڵحە نەیێتە سەر کار چونکە ئەو جوامێری عەرەب و کانگای زێرە. ئەگەر کوڕی ئەبوتالب کاروبارەکان بگرێتەدەست، ئەو لای من ئەخوازراوترین کەسە کاروبارەکان بگرێتەدەست. دوای چەند رۆژ هەواڵی بەیعەتی خەڵکی لەگەڵ عەلی پێگەیشت و ئەم کارەی پێ ناخۆش بو. مایەوە و چاوەڕوانی کرد تا بزانێت خەڵك چی دەکەن. ئاگادار بویەوە کەعایشە و تەڵحە و زوبەیر لەژێر فەرمانی عەلیدا نەماون. دوبارە چاوەڕوانی کرد تا بزانێت چی ڕودەدات. لەم کاتەدا هەواڵی شەڕی وشتریان پێدا و کارەکەی دژوارتر وئەندێشەی پەرێشانتر بو. بیستی معاویە لەشام بەیعەتی لەگەڵ عەلی نەکردوە و کوژرانی عوسمان بەکارێکی گەورە دەزانێت. ئەو معاویەیی لەعەلی زیاتر خۆشدەویست. کوڕەکانی عەبدالله و محەممەدی بانگ کرد و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد و وتی: هیچ چاکەیەك لەعەلیەوە بەئێمە ناگات و ئەو شانازی بەپێشینەی خۆی

دەکات. ئەو لەهیچ یەك لەکارەکانی من ناکاتە شەریکی خۆی.

کوڕەکەی عەبداللە وتی: پێغەمبەر مرد و لەتۆ رازی بو و ئەبوبەکر و عومەر مردن و بەهەمان شێوە لەتۆ رازی بون. بڕوام وایە دەست لەکار بکێشیتەوە و لەماڵەوە دانیشیت تا خەڵك لەدەوری رێبەرێك کۆببنەوە و دواتر تۆ بەیعەتی لەگەڵ بکەیت.

محەممەدی کوڕی پێی وت: تۆکۆڵەکەیەك لەکۆڵەکەی عەرەبەکانیت و گومان ناکەم بێ بەشداری کردنی تۆ ئەم کار سامان پەیا بکات.

عەمرۆ وتی: ئەی عەبداللە، داوای کارێکت لەمن کرد بۆ ئەو دنیام باشترە و دینەکەم بەهێزتر وراستتر دەکات. تۆ ئەی محەممەد، پێشنیاری کارێکت پێکردم بۆ ئەم دنیام باشترە و بۆ ئەو دنیام خراپتر. دواتر لەگەڵ کوڕەکانی خۆی بەرێکەوت تا گەیشتە لای معاویە. خەڵکانی شامی بینی معاویە بۆ تۆڵەسەندنەوەی عوسمان هان دەدەن. عەمرۆ وتی: بەرێگەیەکی راست و دروستا دەڕۆن. داوای خوێنی خەلیفەی ستەملێکراو بکەن. معاویە سەیری نەکرد. کوڕەکانی پێیان وت: نابینی معاویە گرنگی بەتۆ نادات؟ معاویە روی کردە کەسێکیتر. عەمرۆ بەنهێنی ڕۆشتە لای معاویە و وتی: سوێند بەخوا ئەم کارەی تۆ هۆکاری سەرسوڕمانی منە. من بەهەمو هێز و توانام دێمە لای تۆ و تۆ پشت دەکەیتە من. سوێند بەخوا ئەگەر شان بەشانی تۆ شەڕ بکەم و داوای خوێنی خەلیفە بکەم، لەدڵدا ئەم کارە ناڕاوەیەکە چونکە تۆ لەگەڵ کەسێك شەڕ دەکەیت، لەپێشی و خزمایەتی و پێشینەی ئەو بەباشی دەزانیت بەڵام لەبەر ئەم دنیایە ئێمە شوێن تۆ دەکەوین. لەم کاتەدا بو معاویە روی تێکرد و لەگەڵی سازا.

## دەسپێکردنی شەڕی صەفین

کاتێك عەلی دوای تەواو بونی شەڕی وشتر، لەبەسرە گەڕایەوە، ئاهەنگی کوفەی کرد و پەیك و پەیامی بۆ جەریر کوڕی عەبداللە بەجلی فەرمانداری هەمەدان لەلایەن عوسمان و ئەشعەس کوڕی قەیس کارگوزاری عوسمان لەئازەربایەجان رەوانە کرد و فەرمانی پێدان بەیعەت لەخەڵك وەربگرن و دواتر لای ئەو کۆببنەوە. کاتێك هاتن، ویستی نێردراوێك بۆ لای معاویە رەوانە بکات.

جەریر وتی: من رەوانە بکە چونکە پێشینەی هاورێیەتیمان هەیە.

ئەشتەر وتی: ئەو مەنێرە چونکە دڵی لەگەڵ معاویەیە.

عەلی وتی: با بزانم چیمان بۆ دێنێت و چ پەیامێکمان پێ دەدات. جەریری ڕەوانە کرد و لەگەڵ ئەو نامەیەکی بۆ معاویە نارد و ئاگاداری کردەوە کەموهاجیرەکان و ئەنسار بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ ئەو ڕێککەوتون و زوبەیر و تەڵحە پەیمانی خۆیان شکاند و شەڕیان لەگەڵ کرد. ئەو داوای لەمعاویە کرد وەك موهاجیر و ئەنسار بچێتە ژێر فەرمانی.

جەریر بەرەو لای معاویە بەرێکەوت و معاویە زەمانێکی دورودرێژ ماتڵی کرد و بەردەوام داوای مۆڵەتی لێدەکرد. لەم کاتەدا لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عاص راوێژی کرد و عەمرۆ فەرمانی پێدا خوێنی عوسمان بخاتە ئەستۆی عەلی وئەوان ڕەوانەی شەڕ بکات. معاویە ئەم کارەی کرد. خەڵکانی شام پێشتر بۆ ئەم فێڵە ئامادە کرابون. کاتێك عوسمان کوژرا، نەعمان کوڕی بەشیر کراسە خوێناویەکەی ئەوی بردە شام. هەروەها دوپەنجە بڕاوەکەی نایلە، هاوسەری عوسمانی گەیاندە شام. معاویە کراسەکەی لەسەر تەختی وتاردان دانا پەنجەکانی پێوە هەڵواسی. سوپاییەکان و خەڵکی شارەکانی کۆکردەوە و ئەوان ماوەیەك بەدەوری ئەو کراس و پەنجانەدا گریان. خەڵکانی شام سوێندیان خوارد، جگە بۆ شۆردنی شوێنە پیسەکان و شەرمی خۆیان، ئاو لەجەستەیان نەدەن و لەسەر جێگەی نەرم نەخەون تا بکوژەکانی عوسمان بکوژن و هەرکەس لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات، لەناوی ببەن. جەریر لەشامەوە گەڕایەوە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالب و لەمەبەستەکانی معاویە ئاگاداری کردەوە و هەروەها پێی وت خەڵکانی شام بۆ شەڕ کردن هاوپەیمان بون و بۆ عوسمان دەگرێن و دەڵێن: عەلی پەنای بەبکوژەکانی داوە و لەبەر ئەمە ئەوان وازی لێ ناهێنن تا دەیکوژن یا لەسەر دەستی ئەو دەکوژرێن.

ئەشتەر بەعەلی وت: پێشتر لەرەوانە کردنی جەریر کوڕی عەبداللە ڕێگریم کرد وپێم وتی ئەو پیاوێکی خراپەکار و خراپەخوازە. ئەگەر منت ڕەوانە دەکرد باشتر لەم پیاوە بوچونکە ئەوەندە لای معاویە مایەوە تا ئەو دەرگایانەی پشتی پێ بەستبو، کردیەوە و دەرگاکانی دیکەی داخست.

جەریر وتی: ئەگەر تۆ دەڕۆشتیت دەیانکوشتیت و دواتر دەیانوت یەکێك

لەبکوژەکانی عوسمانمان کوشت.

ئەشتەر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر دەڕۆشتم بۆ وەڵامدانەوەیان پەکم نەدەکەوت و معاویەم بەرێگایەکدا دەبرد نەتوانێت پێش وەڵامدانەوە بەمن بیری لێ بکاتەوە. ئەگەر سەروەری باوەڕداران گوێ لەقسە بگرێت، تۆ و کەسانی هاوشێوەی تۆ دەخاتە زیندان تا ئەم بارودۆخە سەقامگیر ببێت.

جەریر ڕۆشت و ئاهەنگی قرقیسیای کرد و بەسەرهاتی خۆی بۆ معاویە نوسی و معاویە وەڵامی دایەوە و داوای لێ کرد بڕواتە لای ئەو.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی معاویەی ناچار کرد جەریری بەجلی سەرنەکەوتو بگەڕێنێتەوە، شورەحبیل کوڕی سێمتی کەندی بو.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو عومەر کوڕی خەتاب شورەحبیلی بۆ لای سەعد کوڕی ئەبی وەقاص لەعێراق رەوانە کرد و بوبە هاورێ و هاورازی سەعد. سەعد لەپێشی پێبەخشی و لەخۆی نزیکی کردەوە. ئەشعەس کوڕی قەیسی کەندی لەبەر ئەو رکەبەریەی لەنێوان ئەم دوانەدا بو، رژدی پێدەبرد. لەم کاتەدا جەریری بەجلی بەمیوانی ڕۆشتە لای عومەر کوڕی خەتاب. ئەشعەس پێی وت: ئەگەر توانیت لای عومەر خراپەی شورەحبیل بڵێیت، کەمتەرخەمی مەکە. کاتێك جەریر ڕۆشتە لای عومەر، سەبارەت بەخەڵك پرسیاری لێکرد و جەریر زۆر وەسفی کوڕی ئەبی وەقاصی کرد و وتی:

| | |
|---|---|
| الا ليتنى و المرء سعد بن مالك | وزبرا و ابن السمط فى لجة البحر |
| فيغرق اصحابى و اخرج سالما | على ظهر قرقور انادى ابابكر |

یانی: خۆزگە من و ئەم پیاوە یانی سەعد کوڕی مالك و زەبرا و کوڕی سێمت هەمومان لەناوەڕاستی دەریا دەبوین. هاورێیانی من لەئاودا دەخنکان و من تەندروست رزگارم دەبو و سوار سەمەندێکی هاوشێوەی کەشتی دەبوم وبانگی ئەبوبەکرم دەکرد.

عومەر نامەی بۆ سەعد نوسی وفەرمانی پێدا زەبرا و شورەحبیل بۆ لای ئەو رەوانە بکات. سەعد هەردوکیانی نارد. ئەو زەبرا ی لەمەدینە هێشتەوە و شورەحبیلی رەوانەی شام کرد. شورەحبیل لەوێ پێشکەوتنی بەدەست هێنا و بوبەیەکێك لەگەورەکان. باوکی ئەو لەفەلەستین بو. کاتێك جەریر بەنامەی عەلی ڕۆشتە لای

معاویە و داوای بەیعەتی لێکرد، معاویە درەنگی خست تا شورەحبیل گەیشت. کاتێك شورەحبیل گەیشت، معاویە ئاگاداری کردەوە کەجەریر بۆ چ کارێك هاتوە. شورەحبیل وتی: سەروەری باوەڕداران، عوسمان خەلیفەی ئێمە بو. ئەگەر دەتوانی داوای خوێنی ئەو بکەیت بمێنەرەوە و گەرنە خۆت لەئێمە بەدور بگرە. جەریر گەڕایەوە و ئەجاشی وتی:

| | |
|---|---|
| شرحبیل ما للدین فارقت امرنا | و لکن لبغض المالکی جریر |
| و قولك ما قد قلت عن امر اشعث | فاصبحت کالحادی بغیر بعیر |

یانی: ئەی شورەحبیل، لەبەر خوا نەبو لەکارەکەی ئێمە خۆت بەدور گرت بەڵکو لەبەر دوژمنایەتی کردن لەگەڵ جەریری مالکی. ئەوەی وتت، هەموی لەڕقی ئەشعەسی قەیس بو و تۆ هاوشێوەی وشترڤانێکی بێ وشتر ئاواز بخوێنێت.

جەریر کوڕی عەبدالله کوڕی جابر کوڕی مالکی بەجلیە. ئەوبەناوی باوەگەورێی بەمالك ناویان بردوە.

عەلی هاتەدەر و لەنەخلیە ئوردوی لێدا. خەڵکانێك لەکوفیەکان لەهاورێیەتی ئەو پاشکشێیان کرد لەناو ئەوان: موڕەی هەمەدانی و مەسروق. ئەوان بەخششەکانی خۆیان وەرگرت وئاهەنگی قەزوێنیان کرد. مەسروق دواتر بەردەوام داوای لێخۆشبونی لەخوا دەکرد لەبەر ئەوەی لەهاورێیەتی عەلی بۆ بەشداری کردن لەشەڕی صەفین پاشەکشێی کردوە. عەبدالله کوڕی عەباس لەگەڵ هاورێیانی خۆی لەخەڵکانی بەسرە هاتنە لای. هەواڵی لەشکرکێشی عەلی بەمعاویە گەیشت و ئەو لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عاص راوێژی کرد. عەمرۆ وتی: ئێستا کەعەلی خۆی بۆ شەڕی تۆ ئامادە کردوە، بەتەنیایی روبەروی ببەرەوە و هەمو فێڵ و فریوێك لەم رێگادا بخەرە گەڕ. معاویە ساز وبەرگ و کەل وپەلی شەڕی هەڵگرت و خەڵك ئەو کارەیان کرد.

عەمرۆ کوڕی عاص بەردەوام خەڵکی بۆ شەڕ هان دەدا و عەلی و هاورێکانی بەسست و لاواز هەژمار دەکرد و دەیوت: عێراقیەکان بلآویان لێکردوە و شکۆی خۆیان لەدەست داوە و تیژی خۆیان کول کردوە. خەڵکانی بەسرە بەناسازگاری وچەند بەرەکی لەگەڵ عەلی بەسەر دەبەن چونکە زۆر لەوانی کوشتار کردوە. سەرکردەکان و گەورەکان ئەوان بەرەو لەناو چون دەڕۆن و گەورکانی کوفە لەشەڕی وشتر کوژراون و

ئێستا عەلی لەگەڵ دەستەیەکی کەم و ناگرنگ بەرێکەوتوە. لەماق خۆتان خۆش مەبن و دەستبەرداری خوێنی خۆتان مەبن.

معاویە خەڵکانی شامی بۆ شەڕ رازاندەوە و ئاڵایەکی بۆ عەمرۆ کوڕی عاص و ئاڵایەکی بۆ دو کوڕەکەی یانی محەممەد و عەبدالله بەست وئاڵایەکی دایە دەست کۆیلەکەی یانی وەردان.

عەلی ئاڵای بۆ کۆیلەکەی خۆی یانی قەنبەر بەست. عەمرۆ بەردەوام دەیوت:

هل يغنين وردان عنى قنبرا          و تغنى السكون عنى حميرا

اذا الكماة لبسوا السنورا

یانی: ئایا دەتوانرێت وەردان دوای قەنبەر بێت؟ و خەڵکی سەکون شەڕی حەمیریەکان بۆ من بەس بکەن کاتێك شەڕکەرە شێرناساکان زرێی پۆڵایین لەبەر بکەن.

ئەم وتەیە بەگوێی عەلی گەیشت و وتی:

لا صبحن العاصى ابن العاصى          سبعين الفا عاقدى النواصى

مجنبين الخيل بالقلاص          مستحقبين حلق الدلاص

یانی: بەحەفتا هەزار شەرکەری ناوچاو بەستو ئاهەنگی شەڕی گوناحکاری گوناحزادە دەکەم تا سوار سەمەنە تیژپێکان ببن و بۆ شەڕی ئەو پەلە بکەن. ئەوانەی ئاڵقەی زرێکانیان بەبەهێزی لەسەر جەستەی خۆیان بەستبێت.

کاتێك معاویە ئەمەی بیست وتی: دەبینم عەلی پیاڵەی پڕی بۆ گێڕاویت. معاویە بەرێکەوت و لەڕۆشتن درەنگی دەکرد. کاتێك وەلید کوڕی عەقەبە ئەمەی بینی، کەسی بۆ لای نارد و بەم شێوەیە پەیامیدا:

الا ابلغ معاوية بن حرب          فانك من اخى ثقة مليم

قطعت الدهر كالسدم المعنى          تهدر فى دمضق فما تريم

و انك و الكتاب الى على          كدابغة و قد حلم الاديم

يمنيك الامارة كل ركب          لانقاض العراق بها رسيم

و ليس اخو الترات بمن توانى          و لكن طالب الترة الغشوم

و ليس اخو التدام بمن تولى          و لكن طالب النزة الغشوم

ولو كنت القتيل و كان حيا لجرد لا الف و لا غشوم

و لا نكل عن الاوتار حتى يبيء بها و لا برم جثوم

و قومك بالمدينة قدا بيروا فهم صرعى كانهم هشيم

یانی: هەواڵێك لەمن بەمعاویە کوڕی حەرب بگەیێنە کە تۆ لەلایەن برایەکی شیاوی باوەرپێکردن، سەرکۆنەکراویت. رۆژگارێکی درێژە وەك وشترێکی ناتەوان، لەدیمەشق ماویتەوە و لەقوڕگی خۆت دەخرۆشیت و لەشوێنی خۆت ناجوڵێیت. تۆ بەنامە نوسینت بۆ عەلی لەژنێکی پێستەچی دەچیت کەدەیەوێت پێستەیەکی کرم لێدراو خۆش بکات. هەر کاروانێك کەلای وێرانەکانی عێراق تێدەپەڕێت و نیشانەیەك لەوێ بەجێ دێڵێت، مژدەی فەرمانڕەوایی تۆ دەدات. ئەو نە هەڵگری داغە فراوانەکانە تا لاوازی بکات بەڵکو خوازیاری بێدادگەری خوێنێك کە لەو رژاندویانەتە سەر زەوی. ئەگەر تۆ دەکوژرایت و ئەو زیندو دەبو، شمشێری خۆی لەکالآن دەردەکێشا، نە لاوازی دەکرد و نەتوڕەییەکی بێهۆی لەخۆی نیشان دەدا. نە لەداوا کردنی خوێن بێ ئاگا دەبو، نەبێزار و نە بەماڵەکەی خۆیەوە دەلکا مەگەر ئەو کاتەی دادی دڵی خۆی وەرگرتبێت و تۆڵەی کردبێتەوە. خەڵکی تۆ لەمەدینە لەناوچون، لەخاك و خوێندا گەوزاون و دەڵێی خەوش و خۆڵی وردوردی پێشێل کراون.

معاویە بۆی نوسی:

ومستبرم مما يرى من اناتنا ولو زبنته الحرب لم يترمرم

یانی: هاوار لەکەسێك کە لەقورسی ئێمە بێزار بوە بەلآم ئەگەر شەڕ زیانی پێگەیاندبو، زمان و دەمی بێ وتنی قسەیەك، نەدەخستە جوڵە.

عەلی زیاد کوڕی نەزری حارسی وەك فەرماندە پێشمنگەکان پێکهاتو لەهەشت هەزار شەڕکەر رەوانە کرد  شوەریح کوڕی هانی هاورێ لەگەڵ چوار هەزار کەس بەدوای ئەودا. عەلی خۆی لەنوخەیلە بەرێکەوت و شەڕکەرانی لەمەداین لەگەڵ خۆی هەڵگرت و سەعد کوڕی مەسعود مامی موختار کوڕی ئەبی عوبەیدی سەقەفی لەم شارە دانا. کاتێك عەلی بەرێکەوت، نابغەی بەنی جەعدە لەگەڵ ئەودا بو. رۆژێك ئەم شێعرەی بۆ خوێند:

قد علم المصران و العراق ان عليا فحلها العتاق

ابيض جحجاح له رواق ان الاولى جاروك لا افاقوا

لكم سباق و لهم سباق قد علمت ذلكم الرفاق

یانی: دو شارەکان و عێراق بەباشی دەزانن عەلی نێرە شێرێکی چاکەکارە. سپی روخسارە، سەروەرێکی رێزدار و پەلەکەرە بەرەو چاکیەکان و شکۆ و مەزنی زۆری پێبراوە. ئەوانەی ستەمیان لەتۆ کرد، لەخەوی مەرگ نەیێنە هۆش. ئێوە هێرش کردنێکتان هەیە و ئەوان هێرش کردنێك، هاورێیان و هاوەڵان دەزانن هەر کام چ پێگە و بەهایەکیان هەیە.

عەلی سێ هەزار پیاوی شەرکەری بەفەرماندەیی مەعقەل کوری قەیس لەمەداینەوە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەموسڵەوە تێپەرێت تا لەرقە چاوی پێی بکەوێت. کاتێك گەیشتە رەقە، داوای لەخەڵك کرد پردێکی بۆ دروست بکەن تا لێی تێپەرێت وبەرەو شام بروات. ئەوان سەرپێچیان کرد چونکە کەشتیەکانی خۆیان ئامادە کردبو. عەلی مالکی ئەشتەری وەك جێگری خۆی دانا و بەرێکەوت تا لەپردی منبەج تێپەرێت. ئەشتەر بانگی کردن و وتی: سوێند دەخۆم ئەگەر بۆ تێپەر کردنی سەروەری باوەرداران پردێك دروست نەکەن شمشێر لەکالان دەردێنم و پیاوەکانتان کوشتار دەکەم و سامانەکانتان تالان! خەڵك لەگەڵ یەك گفتوگۆیان کرد و وتیان: ئەو ئەشتەری نەخەعیە! پیاوێکی شیاوە (دەڵێت و ئەنجام دەدات) یا خراپتر لەوەی وترا، بەلایەکتان بەسەر دێنێت. ئەوان پردێکیان دروست کرد و عەلی و هاورێکانی لێی تێپەرین. لەکاتی تێپەرین فراوان بون و کلاوەکەی عەبدالله کوری ئەبی حوصەین کەوتە ناو ناوەکە، کەهەڵیگرتەوە و سوار بو. دواتر کلاوی عەبدالله کوری حەجاجی ئەزدی کەوت، دابەزی و هەڵیگرت وبەهاورێکەی خۆی وت:

فان يك ظن الزاجرى الطير صادقا كما زعموا اقتل و شيكا و تقتل

یانی: ئەگەر بەهەمان شێوە کەگومانیان کردوە، گومانی گومان کەران بەباڵندەکان راست بێت، بەزویی من و تۆ دەکوژرێین.

کوری ئەبی حوصەین وتی: هیچ پێشهاتێکم زیاتر لەوە خۆش ناوێت. هەردوکیان لەشەری صەففین کوژران.

کاتێك عەلی گەشتە فورات، زیاد کوری ئەزری حارسی و شورەیح کوری هانی پێش

خۆی بۆ کوفە رەوانە کرد. ئەم دوانە لەکوفە هاتبونەدەر. هۆکاری گەڕانەوەی ئەم دوانە ئەوە بو کاتێك عەلی ئەوانی لەکوفەوە رەوانە کرد، لەکەنارەکانی فورات بەوشکاییدا بەرێکەوتن، کاتێك گەشتنە عانات، هەواڵیان پێگەیشت معاویە بەسوپایەك روی کردۆتە شام. وتیان: نا، بەخوا ئەمە بۆچونێکی راست نیە بەرێکەوین و ئەم دەریایە لەنێوان ئێمە و موسوڵمانان و سەرەوەری باوەڕداران جیایی دروست بکات. هەروەها رەوا نیە لەگەڵ ئەم سوپا کەمە روبەروی شامیەکان ببینەوە. ڕۆشتن تا لەعانات تێپەڕن بەلاَم خەڵکەکەی رێگەیان پێنەدان. لەبەر ئەمە گەڕانەوە و لەهیت تێپەڕیان کرد و نەگەشتبونە قرقیسیا چاویان بەعەلی کەوت. کاتێك پێی گەیشتن، فەرموی: پێشەنگەکانم لەپشتەوە بەمن دەگەن!

شورەیح و زیاد لەپێشهاتەکان ئاگاداریان کردەوە.

عەلی وتی: پێشهاتێکی باش بو. کاتێك لەفورات تێپەڕی کرد، ئەو دوانەی لەپێش خۆیەوە رەوانە کرد. کاتێك گەشتنە دیواری رۆم، ئەبو ئەعوەری سەلەمی لەگەڵ سوپایی شامیەکان روبەرویان بویەوە. ئەم دوانە کەسێکیان بۆ لای عەلی رەوانە کرد و ئاگاداریان کردەوە. عەلی کەسی بەدوای ئەشتەردا نارد و فەرمانی پێدا بەخێرایی خۆی بگەیێنێت و پێی وت: کاتێك گەیشتیت، تۆ فەرماندە بیت. شەڕ لەگەڵ ئەم خەڵکە دەست پێنەکەیت مەگەر ئەوان دەست پێبکەن. دەبێت چاوت پێیان بکەوێت و داوای ئاشتیان لێبکەیت و گوێ لەوتارەکانیان بگریت. نابێت رق و کینەی ئەم خراپە خوازانە تۆ ناچار بەشەڕ کردن بکات مەگەر ئەوەی چەندین جار پێشنیاری ئاشتی و لایەنگیری کردن لەراستی و دروستیان پێ بکەیت و ئەرکی سەرشانت بەکۆتایی بگەیێنیت. زیاد وەك فەرماندەی باڵی چەپ و شورەیح وەك فەرماندەی باڵی راست دەستنیشان بکە. نەئەوەندە لێیان نزیك ببەرەوە کەبتەوێت شەڕ دەست پێبکەیت نەئەوەندە دوربکەوەرەوە کەنیشانی بدات لەشەڕ دەترسیت. بەمشێوەبە تا دەگەمە لای تۆ. بەخواستی خوا بەخێرایی خۆم بەتۆ دەگەیێنم. عەلی نامەی بۆ زیاد و شورەیح نوسی وفەرمانی فەرمانبردن لەئەشتەری پێدان.

ئەشتەر بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت تا گەشتە لای ئەوان و ئەوەی فەرمانیان پێدابو بەئەنجامی گەیاند و دەستی لەشەڕ کردن هەلگرت. هەمویان لەجێگەکانی خۆیان

وەستا بون، کاتێك دەمەوئێوارێ گەیشت، ئەبونەعومر هێرشی کردە سەریان. ئەمان لەبەرابەر ئەو خۆڕاگریان کرد و شەڕیان کرد و دواتر شامیەکان گەڕانەوە. بەیانی هاشم کوڕی عەتەبەی مێرقال بەرەو شامیەکان ڕۆشتەدەر وئەبونەعومر بۆ شەڕی ئەو هاتەدەر. ئەو دوانە شەڕیان دەست پێکرد و دواتر گەڕانەوە. ئەبو ئەعومر لەپشتەوە لەو جێگەدا وەستا کەیەکەم جار وەستابو. ئەشتەر هات و هاوڕێکانی لەجێگەی دوێنێکەی ئەبونەعومر ریزیان بەست. ئەشتەر بەسەنان کوڕی مالکی نەخەعی وت: برۆ ناو گۆڕەپانی شەڕ و داوای روبەروبونەوە لەئەبو ئەعومر بکە.

پرسی: روبەروبونەوە لەگەڵ من یاتۆ؟

ئەشتەر وتی: ئەگەر فەرمانی روبەروبونەوە بەتۆ بدەم، ئەو کارە دەکەیت؟

سەنان وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا ئەگەر فەرمان بدەیت ریزەکانی ئەوان بەشمشێر لەت و پەت بکەم، ئەو کارە دەکەم! ئەشتەر لەخوا بۆی پاڕایەوە و وتی: داوای روبەروبونەوەی ئەو بۆ من دەکەیت.

سەنان روی کردە ئەوان وتی: ئەمان بدەن چونکە پەیامێکم پێیە. ئەمانیان پێدا. رۆشتە لای ئەبونەعومر و پێی وت: ئەشتەر داوای روبەروبونەوەت لێدەکات.

ئەبونەعومر ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بو و دواتر وتی: سەرسەریەتی و ڕەشبینی ئەشتەر ناچاری کرد فەرماندەکانی عوسمان لەعێراق دەربەڕێنێت و چاکەکانی ئەو فێزەون نیشان بدات و دواتر هێرش بکاتە سەر ماڵەکەی و خوێنی برێژێت. ئێستا هەموان بەدوای تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمانن. من پێویستم بەروبەروبونەوە لەگەڵ ئەو نیە.

سەنان وتی: ئەوەی ویستت، هێناتە سەر زمان، ئێستا گوێ لەوەڵامی من بگرە.

ئەبو ئەعومر وتی: پێویستم بەوەڵامی تۆ نیە. لەبەرچاوی من مەمێنە. هاوڕێکانی بانگیان کرد و گەڕایەوە و ڕۆشتە لای ئەشتەر و ئاگاداری کردەوە.

ئەشتەر وتی: ئەو پارێزگاری لەگیانی خۆی کرد. هەردولای شەڕکەر چاوەرێیان کرد تا تاریکی دیوارێکی گەورەی لەنێوانیاندا دروست کرد. خەڵکانی شام شەوانە گەڕانەوە و عەلی لەکاتی بەرەبەیان خۆیان گەیاندە ئەشتەری نەخعی. ئەشتەر و هاوڕێکانی بەرێکەوتن و خۆیان گەیاندە نزیك معاویە و لەبەرابەر ئەو ریزیان بەست. عەلی

پەیوەستیان بو. شەڕکەران ماوەیەکی درێژ چاوەڕێیان کرد.

دواتر عەلی بەدوای جێگەیەك بۆ سوپاکەی خۆی گەڕا و تیایدا دابەزی. معاویە پێشتر هاتبو و پانتاییەکەی بەربلاو و تەختی بۆ خۆی هەڵبژاردبو. ئەو قەراغ ئاوەکانی فوراتی هەڵبژارد و لەوێ جگە لەو شوێنە قەراغ ئاوی دیکەی لێ نەبو. معاویە قەراغ ئاوەکانی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی. ئەبوئەعورەی سەلەمی ڕەوانە کرد تا پارێزگاری ئەو شوێنانە بکات. هاورێکانی عەلی بەدوای جێگەیەکی لەو چەشنە گەڕان بەلام دەستیان نەکەوت. هاتنە لای عەلی و لەم کارەی دوژمن و تینویەتی خەڵك ئاگاداریان کردەوە. ئەو صەعصە کوڕی صوحانی بۆ لای معاویە نارد و پەیامیدا کە: ئێمە ئەم ڕێگا درێژەمان بڕیوە و شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە پێش ئەنجامدانی گفتوگۆی پێویست بەناڕەوا دەزانین. بەلام سوارەکان و پیادەکانی تۆ هاتن وپێش ئەوەی کارێك بکەین هێرشیان کردە سەرمان لەگەڵ ئەوەی بۆچونی ئێمە بەو شێوە بو دەست درێژی نەکەینە سەر ئێوە تا پێشنیاری ئاشتیتان پێبکەین و بەڵگەکانی خۆمان نیشان بدەین. ئێستا کارێکی قێزەونی دیکەتان ئەنجامداوە. خەڵکتان لەئاو دورکردۆتەوە و دەستی لێ هەڵناگرن. فەرمان بەهاورێکانت بدە ڕێگەی ئاو بۆ ئێمە بکەنەوە و دەست لەشەڕ هەڵبگرن تابزانین لەنێوان ئێمە چ پێشهاتێك ڕودەدات وبۆچی ئاهەنگی ئێرەمان کردوە. بەلام ئەگەر دەتەوێت ئەو کارەی بۆ ئەنجامدانی هاتوینن پشتگوێی بخەین و لەسەر ئاو شەر تاقی بکەینەوە تا ئەو کەسەی سەرکەوتن بەدەست دێنێت، ئاو بخواتە، ئەو کارە دەکەین.

معاویە بەهاوەلانی خۆی وت: دەڵێن چی؟

عەبداللە کوڕی سەعد و وەلید کوڕی عەقەبە وتیان: ڕێگەی ئاویان پێمەدە بەهەمان شێوە کەرێگەی ئاویان لەعوسمان بەست. ئەوان لەتینویەتیدا بکوژە، خوا بیانکوژێت!

عەمرۆ کوڕی عاص وتی: ڕێگەی ئاو بۆ ئەو خەڵکە بکەرەوە چونکە ئەوان بەوە رازی نابن تۆ تێراو و ئەوان تینو بن. لەسەر شتێکی دیکە جگە لەئاو شەڕ دەست پێبکە. بزانە لەنێوان خۆت و خوا چی دەکەیت.

`وەلید و عەبداللە کوڕی سەعد جارێکی دیکە وتارەکەی خۆیان هێنایە سەرزمان و

وتیان: تاشەو رێگەی ئاویان لێبگرە، ئەگەر نەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن، دەگەڕێنەوە و ئەمە هۆکاری شکەستی ئەوان دەبێت. رێگەی ئاویان لێ بگرە خوا لەرۆژی هەستانەوە ئاویان لێ درێغ بکات!

صەعصەعە دەڵێت: خوا لەرۆژی هەستانەوە ئاو لەستەمکاران و عەرەق خۆرەکان درێغ دەکات. خوا تۆ لەگەڵ ئەم پیاوە خراپەکارە (وەلید کوڕی عەقەبە) نفرین بکات! ئەوان جوێنیان پێدا و دەیانترساند.

دەستەیەك دەڵێن: وەلید کوڕی ئەبی سەرح لەشەڕی صەفین ئامادە نەبو.

صەعصەعە گەڕایەوە وعەلی ئاگادار کردەوە و وتی: معاویە وتویەتی: وەڵامتان دەدەمەوە. ئەو سوارەکانی بۆ هاوکاری ئەبوئەعوەر رەوانە کرد تا رێگەی ئاو لەهاوەڵانی عەلی بگرن. کاتێك عەلی ئەمەی بیست، وتی: لەسەر ئاو شەڕیان لەگەڵ بکەن.

ئەشعەس کوڕی قەیسی کەندی وتی: من شەڕی ئەوان دەسپێدەکەم. ئەو روبەرویان بویەوە. کاتێك هاوەڵانی عەلی لێیان نزیك بونەوە، ئەوانیان تیرباران کرد و هەردولا دەستیان بەتیربارانی یەکتر کرد و ماوەیەك لەسەر ئەم کارە بەردەوام بون و دواتر بەڕمەکان کەوتنە گیانی یەك، دوای ئەوە شمشێرەکانیان دەرکێشا و کاتژمێرێك خۆیانیان سەرقاڵ کرد. معاویە یەزید کوڕی ئەسەدی بەجلی قەسری باوەگەوڕێی خالید کوڕی عەبداللەی قەسری لەگەڵ سوارەکان بۆ هاوکاری ئەبوئەعوەر رەوانە کرد. عەلی شەبەس کوڕی رەبعی ریاحی رەوانە کرد و شەڕ روی لەدژواری کرد. معاویە عەمرۆعاصی بەسوپایەکی گەورە بۆ گۆڕەپانی شەڕ رەوانە کرد و بەردەوام هێزە پشتیوانەکانی بۆ ئەبو ئەعوەر و یەزید کوڕی ئەسەد رەوانە دەکرد. عەلی ئەشتەری نەخەعی لەگەڵ سوپایەکی گەورەدا بەرێخست و هەمو هێزە پشتیوانەکانی بۆ هاوکاری ئەشعەس و شەبەس رەوانە کرد. تا دەهات شەڕەکە زیاتر و زیاتر قورس دەبو. عەبدالله کوڕی عەوف ئەزدی ئەحمەری وتی:

| | |
|---|---|
| خلوا لنا ماء الفرات الجاري | او اثبتوا لجحفل جرار |
| لكل قرم مستميت شاري | مطاعن برمحه كرار |
| ضراب هامات العدى مغوار | لم يخش غير الواحد القهار |

یانی: ئاوی ڕەوانی فورات بەئێمە بسپێرن یاله بەرابەر سوپایەکی گەورە و فراوان کەتیایدا سوارەکان تیژپێ بن، خۆراگری بکەن، لەبەرابەر سەرومرە گەورەکان کە پشت دەکەنە مەرگ، بەردەوام هێرش دەکەن و بەرم دوژمن دەکوتن و لەناوی دەبەن، ئەو هێرشبەرانەی تەوقە سەری دوژمنان دەقلیشێنن و جگە لەخوای تاقانەی سەرکوتکەری ستەمکاران، لەکەس ناترسن.

ئەوەندە شەڕیان لەگەڵ خەڵکانی شام کرد تا لەئاوەکە دوریان کردنەوە و ئاوەکان کەوتنە دەست هاوەڵانی عەلی. وتیان: سوێند بەخوا یەك دڵۆپ ئاو بەخەڵکانی شام نادەین!

عەلی پەیامی بۆ هاوەڵانی خۆی نارد: نیازەی خۆتان لەئاوەکە هەڵگرن و رێگەی ئەوان بۆ ئاوەکە مەبەستن چونکە ستەمکاری ئەوان بوە هۆی ئەوەی خوا ئێوە بەسەر ئەواندا زاڵ بکات. عەلی دوورۆژ چاوەڕوانی کرد، نەکەسی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد و نەکەس هاتە لای. دواتر ئەبوعەمرۆ بەشیر کوڕی عەمرۆ کوڕی مێحصەنی ئەنساری و سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی و شەبەس کوڕی رەبعی تەمیمی بانگ کرد وپێی فەرمون: بڕۆنە لای ئەو پیاوە و داوای لێبکەن فەرمانبەری و هاورێیەتی کۆمەڵانی خەڵك بکات.

شەبەس کوڕی رەبعی وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران، ئایا تەماحکاری ناکەیت ئەگەر بەیعەت لەگەڵ تۆ بکات، کارێکی پێدەسپێری یا پێگەی بەرز دەکەیتەوە تا لای تۆ کەڵکی لێوەربگرێت؟

عەلی وتی: بڕۆن و بەڵگەی بۆ بێننەوە و بزانن بۆچونی چیە. ئەم کارە لەیەکی زی حەججە/٢١ مەی٦٥٧ زایینی ئەنجام درا. ئەم سیانە ڕۆشتنە لای معاویە. بەشیر کوڕی عەمرۆ ئەنساری دەستی بەقسە کردن کرد. سەرەتا سوپاسی خوای کرد و وەسفی کرد و وتی: ئەی معاویە، ئەم جیهانە پشت دەکاتە تۆ و تۆ بۆ ئەو جیهان دەگەڕێیتەوە. بەیانی خوا لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دەکات و تۆ بۆ کردارەکانت سزا دەدات. سوێند دەدەم تا ئەم ئۆمەتە پەرژ و بڵاو نەکەیت و خوێنرێژی و کوشتار لەناویاندا دورست نەکەیت.

معاویە قسەکەی بڕی و وتی: بۆ بەم شێوەیە ئامۆژگاری رێبەرەکەی خۆت ناکەیت؟

باوکی عەمرۆ وتی: سەرومری من وەك تۆ نیە. سەرومری من شیاوترینی خەڵکان بۆ فەرمانڕەوایی کردنی موسوڵمانانە لەسەر بنەمای لەپێشی و دینداری و پێشینەی ئیسلام و نزیکایەتی ئەو لەگەڵ پێغەمبەر.

معاویە وتی: دەڵێت چی؟

ئەبو عەمرۆ وتی: داوای خواپەرەستی لەتۆدەکات و لەتۆی دەوێت بانگەوازی کوڕە مامەکەت بەشێوەیەکی راست و دروست وەڵام بدەیتەوە چونکە ئەم کارە ئەم دنیا و ئەو دونیا بۆ تۆ دەپارێزێت و بۆ ئەنجامی کارەکانی تۆ شیاوترە!

معاویە وتی: یانی خوێنی عوسمان پشت گوێ بخەین؟ سوێند بەخوا هەرگیز ئەو کارە ناکەین.

دەڵێت: لەم کاتەدا سەعید کوڕی قەیس ئاهەنگی قسە کردنی کرد بەڵام شەبەس کوڕی رەبعی پێشی کەوت و سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەی معاویە، زانیم چۆن وەڵامی کوڕی مێحصەنت دایەوە، سوێند بەخوا ئەوەی لەدڵتایە، لای ئێمە شاراوە نیە. تۆ بیانوێکت نیە خەڵکی پێ فریو بدەیت تا ئەندێشەی ئەوان لەگەڵ خۆت سازگار بکەیت و گومڕایان بکەیت. لەبەر ئەمە وتت: رێبەرەکەتان بەستەم کوژرا و ئێمە داوای خوێنی ئەو دەکەین. بەدوای ئەم کارە، دەستەیەك نەزان وەڵامی تۆیان دایەوە. ئێمە باش دەزانین تۆ لەهاوکاری کردنی عوسمان خۆت بەدور گرت و خۆت دواخست و خوازیاری کوژرانی ئەو بویت تا بەو پێگە بکەیت کەئێستا خوازیاری پێی. بەڵام زۆرن ئەو کەسانەی بەدوای مەبەستێکدا دەڕۆن و ئارەزوی دەکەن بەڵام خواوەند رێگەیان لێ دەگرێت. هەروەها زۆرن ئەو کەسانەی زیاتر لەئارەزوی خۆیان بەدەست دێنن. سوێند بەخوا لەهیچ کام لەم دوانە سودت دەست ناکەوێت و هیچیان لەبەرژەوەندی تۆدا نیە! سوێند بەخوا ئەگەر لەوەی دەتەوێت سەرکەوتو نەبیت، خراپترینی رۆژگاری عەرەبەکانت دەبێت و ئەگەر ئەوەی ئارەزوی دەکەیت بەدەستی بێنیت، بەدەستی ناهێنیت مەگەر دوای ئەوەی لەلایەن خواوە مژدەی ئاگرت پێ بدرێت! ئەی معاویە، لەخوا بترسە و دەست لەم ئارەزوەت هەڵگرە و خۆت لەوەی شیاوە بۆ کەسانیتر، هەڵمەقورتێنە.

دەڵێت: معاویە سوپاسی خوای کرد و وتی: دوای سڵاو، یەکەم شت کەبەهۆیەوە بێ

ئاوزی تۆم بۆ دەرکەوت، ئەوە بو ڕێگەی قسە کردنت لەم پیاوە بەرێزە بڕی و وتاری ئەوت کەگەورەی خەڵکەکەی خۆیەتی، پشت گوێ خست و دواتر سەبارەت بەبابەتێك قسەت کرد هیچ زانیاریەکت لەسەری نیە. درۆت کرد و شیاوی سەرکۆنە کردنی ئەی عەرەبی سەرسەری ستەمکار، هیچ یەك لەقسەکانت ڕاست و دروست نەبو. لەمن دورکەونە چونکە تەنیا شمشێر لەنێوان من و ئێوە داوەری دەکات.

شەبەس کوڕی ڕەبعی پێی وت: ئێمە لەشمشێر دەترسێنیت؟ سوێند بەخوا بەزویی ئەنجامەکەی دەبینیت. ئەوان بۆ لای عەلی گەڕانەوە و ئاگاداریان کردەوە. عەلی بەمشێوەیە شەڕی دەست پێکرد کە بەپیاوێکی گەورەی دەفەرمو و لەگەڵ دەستەیەك لەهاوڕێکانی خۆی دەڕۆشت و لەو لایش پیاوێکی دیکە لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی معاویە دەهاتەدەر و هەردو دەستە شەڕی یەکیان دەکرد و دەگەڕانەوە. نەیاندەویست شەڕێکی سەراسەری گشتی عێراقیەکان لەگەڵ خەڵکانی شام روبدات چونکە ترسی ئەوەیان هەبوە خەڵك بەتەواوەتی لەناو بچن. عەلی هەندێ جار ئەشتەری نەخەعی ڕەوانە دەکرد و هەندێ جار حجر کوڕی عودەی کەندی یا شەبەس کوڕی ڕەبعی یا خالد کوڕی مەعمێر یا زیاد کوڕی نەزر یا مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی کوڕی سەعدی ئەنساری. ئەشتەر زیاتر لەهەموان بۆ شەڕەکان ڕۆشتەدەر.

معاویە ئەم کەسانەی یەك یەك ڕەوانەی شەڕ کرد. عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید، ئەبونەعوەری سەلەمی، حەبیب کوڕی موسلیمەی فێهری، کوڕی زی ئەلکەلاعی حەمیری، عوبەیدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب، شورەحبیل کوڕی سێمتی کەندی و حومرە کوڕی مالکی هەمەدانی. ئەوان سەراسەری زی حەججە /مەی-ژوئەنی ٦٥٧ زاینیان بەشەڕ بەسەر برد. هەندێ کات ڕۆژانە دوجار شەڕیان دەکرد.

## ئاماژەدان بەچەند روداوێك

لەم ساڵەدا و ماوەیەك دوای کوژرانی عوسمان، حوزەیفە کوڕی یەمان مرد. ئەو لەشەڕی وشتر ئامادە نەبو. کوڕەکانی صەفوان و سەعید لەسەر پێشنیاری باوکیان لەشەڕی صەففین شان بەشانی عەلی شەڕیان کرد تا کوژران. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٥٦/٣٥ زایینی مرد. وتاری یەکەم ڕاستترە.

هەروەها لەم ساڵەدا، بەوتەی دەستەیەك، سەلمانی فارسی لەدوسەد و پەنجا ساڵیدا مرد. ئەمە كەمترین ئەندازەیەكە بۆ تەمەنی ئەو ئاماژەیان پێداوە. دەستەیەك دەڵێن: سێسەد و پەنجا ساڵ ژیا و بەشێك لەهاوەڵانی مەسیحی بینی.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله كوڕی سەعد كوڕی ئەبی سەرح لەكاتی ڕۆشتنی معاویە بۆ شەڕی صەفین، مرد. ئەو حەزی نەدەكرد لەناو سوپای معاویەدا شەڕ بكات.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان كوڕی عودەیسی بەلەوی سەركردەی هاتوان لەمیسر بۆ كوشتنی عوسمان مرد. ئەو لەو كەسانە بو لەژێر دارا بەیعەتی لەگەڵ پێغەمبەر كرد. دەستەیەك دەڵێن: لەشام كوژرا.

هەروەها قودامە كوڕی مەزعون لەكۆچكەران بۆ حەبەشە و لەشەڕكەرانی بەدر مرد.

لەم ساڵەدا عەمرۆ كوڕی ئەبی عەمرۆ كوڕی زەببەی فێهریماڵئاوایی لەجیهان كرد. پێیان دەوت ئەبو شەداد و لەشەڕكەرانی بەدر بو.

هەرووەها لەم ساڵەدا عەلی كوڕی ئەبی تالب یەزید كوڕی حەجیەیی تیمی (تیم لات)ی وەك فەرمانڕەوای شاری رەی دەست نیشان كرد. ئەو سی هەزار درەمی لەباج كەم كردەوە. عەلی نامەی بۆ نوسی و بانگی كرد و سەبارەت بەسامانەكان پرسیاری لێكرد و وتی: ئەو سامانەی دزیت، لەكوێیە؟

وتی: هیچم نەدزیوە، عەلی چەند قامچیەكی لێدا و ئەوی خستە زیندانەوە و كۆیلەكەی خۆی سەعدی راسپارد چاودێری بكات. یەزید لەدەست ئەو هەڵات و پەیوەستی شام بو. معاویە سامانەكەی بەو بەخشی و ئەو دواتر خراپەی عەلی كوڕی ئەبی تالبی دەوت. تا ئەو كاتەی فەرمانڕەوایی بەمعاویە گەیشت، لەشام مایەوە. معاویە هاتە عێراق و یەزیدی كردە فەرمانڕەوایی رەی. دەستەیەك دەڵێن: ئەو هاوڕێ لەگەڵ عەلی لەشەڕی وشتر و صەفین و نەهرەوان بەشداری كرد و دواتر عەلی وەك فەرمانڕەوایی رەی دەستنیشانی كرد و ئەوەی ئاماژەی پێدرا، رویدا. راستیەكەی ئەمەیە.

# ڕووداوەکانی ساڵی سی و حەوتی کۆچی ( ٦٥٦-٦٥٨ زایینی )

## شەڕی صەفین

لەم ساڵەدا لەمحەرەم/١٩ ژوئەن – تا ١٩ ژوئیە ٦٥٧ زایینی پەیمانێکی نەنوسراو لەنێوان عەلی و معاویە بەسترا تا کۆتایی بەشەڕ بێنن بۆ ئەوەی مانگی نازەوا تێپەڕ بکەن و ئەگەری هەیە لەکۆتاییدا بەئاشتی بگەن. نێردراوەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد. عەلی بەنوێنەرایەتی خۆی عودەی کوڕی حاتەم و یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی و شەبەس کوڕی زیاد کوڕی حەفصەی ڕەوانە کرد.

سەرەتا عودەی کوڕی حاتەم دەستی بەقسە کرد. سوپاسی خوای کرد و وتی: دوای سلاو، ئێمە هاتوینەتە لای تۆ تا پێشنیاری کارێکت پێ بکەین تا لەسەر بنەمای ئەوپێشنیارە، خوا یەکمان بخات و ئۆمەت یەکگرتو بکات، خوێنەکان بپارێزێن و لەنێوان ئەم دودەستە برایە ئاشتی سەقامگیر بکەین. کوڕە مامی تۆ سەروەری باوەڕداران و لەپێشترینی ئەوان لەڕوانگەی پێشینە کار و ژیان و باشترینی ئەوان بۆ کاریگەری دانان لەسەر ئیسلامە. هەمو خەڵك دەوریان گرتوە جگە لەتۆ و هاورێکانت، کەس نەماوە پشت بکاتە عەلی کوڕی ئەبی تالب. ئەمە هیچ زیانێك لەو نادات چونکە لەکۆنەوە دەزانێت:

ئەگەر گوڵی شەست پەڕ گەرمی هەتاوی نەوێت گەرمی بازاری هەتاو کەم ناکات.

بترسە ئەی معاویە، تا ئەو بەلا بەسەر تۆ و هاورێکانت نەیێت کە لەشەڕی وشتر بەسەر سوپای عایشەدا هات.

معاویە پێی وت: دەڵێی هاتویت بمترسێنیت نەك ئەوەی پێشنیاری ئاشتیم پێ بدەیت! نابێت و شتی وا نابێت ئەی عودەی. من کوڕی حەربم. ( معاویە کوڕی صەخر کوڕی حەرب). تۆ لەو کەسانەی دژی عوسمان شۆڕشت کرد و لەبکوژەکانی ئەویت. هیوادارم خوا لەتۆڵەی خوێنی ئەو تۆ بکوژێت.

شەبەس و زیاد یەك وەلامیان دایەوە: ئێمە بۆ کارێك هاتوین کەئێمە و تۆ بەرزگاری دەگەیێنێت و ئێستا تۆ چیرۆکمان بۆ باس دەکەیت! ئەوەی سودی نیە، پشت گوێی بخە و وەلامێك بدەرەوە سود و بەرژەوەندی هەموانی تیا بێت.

یەزید کوڕی قەیس وتی: ئێمە تەنیا هاتوین پەیامی خۆمان بگەیێنین و وەڵام ببیستین و عەلی لێ ئاگادار بکەینەوە. بەڵام ئامۆژگاری کردنی تۆ پشت گوێ ناخەین. بۆیە بیری تۆی دەخەینەوە  تا ببێتە بەڵگە بۆتۆ و بەسازان و خۆشی کۆتایی بەم بارودۆخە بێت. سەرەڕوی ئێمە ئەو کەسەیە هەمو موسوڵمانان بەخەلافەتی ئەو رازی بون وئەمە لەتۆ شاراوە نیە. ئەی معاویە لەخوا بترسە و ناسازگاری لەگەڵ مەکە چونکە سوێند بەخوا ئێمە هاوتای ئەومان نەبینیوە و زیاتر لەهەموان لەسەر بنەمای راستی و دروستی کردەوە و کارەکان ئەنجام دەدات وزیاتر لەهەموان پشتی کردۆتە ئەم دنیا و زیاتر لەهەمو خەڵکەکان خوازیاری خو و نەریتی چاکەیە.

معاویە سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: دوای سڵاو، ئێوە پێشنیاری فەرمانبەری و سازگاری لەگەڵ موسوڵمانەکانتان بەمن کرد. بەڵام کۆمەڵانی خەڵکی موسوڵمان کەداوای هاوپەیمانی من لەگەڵ ئەوان دەکەن، لەگەڵ ئێمەیشدان و منیش ئەم شوێنکەوتوانەم هەیە. بەڵام فەرمانبردن لەرێبەرەکەی ئێوە، بەوە رازی نابین چونکە رێبەری ئێوە خەلیفەی ئێمەی کوشت و بڵاوەی بەدەستەکانی ئێمە کرد و بکوژەکانی عوسمانی پەنادا. سەرەڕوی ئێوە گومان دەکات ئەوی نەکوشتوە. ئێمە ناڵێین کوشتویەتی بەڵام دەبێت بکوژەکانی عوسمان رادەستی ئێمە بکات تا بیانکوژین و دواتر وەڵام دەدەینەوە و لەگەڵ خەڵك رێدەکەوین و لەرێبەرەکەی ئێوە فەرمان دەبەین.

شەبەس کوڕی رەبعی وتی: ئەی معاویە، ئایا حەز دەکەیت، عەمار کوڕی یاسر بکوژیت؟

معاویە وتی: چ شتێك رێگەی ئەم کارەم لێ دەگرێت؟ ئەگەر دەستم بەکوڕی سومەییە بگات، ئەو لەبەرابەر کۆیلەکەی عوسمان دەکوژم.

شەبەس وتی: سوێند بەخوا کەجگە لەو خوایەك نیە، بەمەبەستەکانی ئەم دنیا ناگەیت مەگەر ئەوەی سەری زۆر لەجەستەکان جیاببنەوە و زەوی و ئاسمان لەتۆ تەنگ بکات.

معاویە وتی: ئەگەر وابێت، لەتۆ تەنگتر بێت!

خەڵك لەدەوری معاویە بڵاوەیان لێکرد و معاویە کەسی بۆ لای زیاد کوڕی حەفصە نارد و راوێژی لەگەڵ کرد و وتی: ئەی برای رەبیعە، عەلی پەیوەندی خزمایەتی

لەگەڵ ئێمەی پچڕاند و خەلیفەکەمانی کوشت و بکوژەکانی عوسمانی پەنا دا. داوا لەتۆ دەکەم هاوڕێ لەگەڵ خەڵکەکەت بۆ هاوکاری من بەرێکەویت و دواتر پەیمان و سوێندی خوایی لەئەستۆی مندا بێت ئەگەر سەرکەوتم، تۆ دەکەمە فەرمانڕەوایی یەکێك لەدو شارەکان، هەرکامیان دڵت بیخوازێت.

زیاد وتی: دوای سڵاو. من لای خوا پێگەیەکی رون و ئاشکرام هەیە و بەخششەکانی خۆی بەمن بەخشیوە. نابمە پشتیوانی ستەمکاران و گوناحکاران! ئەمەی وت و هەستا.

معاویە بەعەمرۆعاصی وت: لەگەڵ هیچ یەك لەوان قسە ناکەم مەگەر وەڵامێکی باشەم بداتەوە، دڵیان یەك و یەکگرتوە.

معاویە حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری و شورەحبیل کوڕی سێمت و مەعن کوڕی یەزید کوڕی ئەخنەسی بۆ لای عەلی رەوانە کرد. ئەوان بەرێکەوتن و رۆشتنە لای عەلی. حەبیب سوپاسی خوای کرد سڵاوی کرد و دواتر وتی: دوای سڵاو، عوسمان خەلیفەیەکی چاکەکار بو و نوسراوی خوای بەکار دەبرد و پشتی بەفەرمانە خواییەکان دەبەست. ئیوە ژیانی ئەوتان بەناڕەوا لەقەڵەمدا و مەرگی ئەوتان بەدرەنگ دەزانی و هێرشتان کردە سەری و کوشتتان. ئەگەر گومان دەکەیت، عوسمانت نەکوشتوە، بکوژەکانی بەئێمە بسپێرە تا ئەوان لەبەرابەر ئەو بکوژین. دواتر لەخەلافەت دەست هەڵگرە تا خەڵك لەنێوان خۆیان راوێژ بکەن و هەرکەسیان هەڵبژارد بیکەنە فەرمانڕەوایی خۆیان.

عەلی وتی: ئەی پیاوی بێ دایك وباوك! تۆ کارت بەم کارانە چیە؟ بێدەنگ بو چونك لەم پێگەدا نیت وبۆ وتنی ئەم قسانە شیاو نیت.

حەبیب وتی: سوێند بەخوا لەجێگەیەك دەمبینی هیچ کات پەسەندی ناکەیت.

عەلی پێی وت: تۆ خۆت چیت؟ خوا رێگەت نەدات زیندو بیت ئەگەر رێگە بدەیت ئێمە زیندو بین. ون بە لەبەرچاوم و هەرچەندە دەتەوێت هەڵبەز و دابەز بکە.

شورەحبیل وتی: من قسەیەك جگە لەقسەکانی هاورێکەم نیە، ئایا جگە لەمە وەڵامێکت پێیە؟

عەلی وتی: جگە لەوە هیچ وەڵامێکم پێ نیە.

دواتر عەلی سوپاسی خوای کرد و وتی: دوای سڵاو، خوا محەممەدی بەراستی و

دروستی هەڵبژارد و خەڵکی بەهەمو گومڕایی خۆیانەوە لە لەناوچون رزگار کرد و دوای بلاوبونەوە یەکیخستن. دواتر گیانی ئەوی بردەوە بۆ خۆی و خەڵك ئەبوبەکریان وەك خەلیفە هەڵبژارد و ئەبوبەکر عومەری هەڵبژارد. ئەم دوانە هەردوك کرداری چاکەیان گرتەبەر لەسەر بنەمای دادپەروەری هەڵس وکەوتیان کرد. ئێمە رەخنەی ئەوەمان لێگرتن کە بەم کارە هەستان و دەمانزانی ئێمە بنەماڵەی پێغەمبەرین. بەلام لەم کارەی ئەوان خۆشبوین. دواتر عوسمانیان هێنایە سەرکار و چەندین کاری کرد کەخەڵکان بەناڕەوا و نەشیاو لەقەڵەمیاندا و هێرشیان کردە سەری و خوێنیان ڕشت.

دواتر خەڵك هاتنە لای من و پێیان وتم: بەبەیعەتی ئێمە رازی بە. من رازی نەبوم. وتیان: بەبەیعەت رازی بە چونکە ئەم خەڵکە جگە لەتۆ پەسەند ناکەن و ئێمە دەترسین ئەگەر رازی نەبیت، خەڵك بلاوەی لێبکەن. من بەیعەتم کرد بەلام ئەوەی منی داچڵەکاندا ناسازگاری دوپیاو بو کەبەیعەتیان لەگەڵ من کردبو و ناسازگاری معاویە کەهیچ پێشینەیەکی لەئیسلامدا نیە و هەنگاوێکی راستی بۆ ئیسلام هەڵنەگرتوە.

برازایەکی ریسوا کەپێغەمبەر ئازادی کرد و باوکیشی لەسەر دەستی ئەو ئازادی بو. ئەوان دەستەیەکی بچوکن لەدەستەکان. پیاوێك کەبەردەوام لەگەڵ پێغەمبەری خوا دژایەتی دەکرد و بەردەوام خۆی وباوکی رێگەی فرت و فێڵیان دەگرتە بەر و سەرئەنجام بەزۆر وبەشەرمەوە باوەڕیان بەئیسلام هێنا. لەهیچ سەرم سوڕنامێنێت جگە لەوەی بۆ ئێوە لەدەوری ئەو کۆبونەوە و فەرمان لەو دەبەن. بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر پشت گوێ دەخەن لەکاتێکدا نافەرمانی کردن و ناسازگاری لەگەڵ ئەوان شیاو نیە. داوتان لێدەکەم بۆ نوسراوی خواوەند و شێوەی هەڵس و کەوتی پێغەمبەر و لەناو بردنی ناڕاستی و خراپەکاری و زیندو کردنەوەی راستی و سەقامگیر کردنی کۆڵەکەکانی ئایین بگەڕێنەوە و هەوڵ بدەن. ئەمە دەڵێم و بۆ خۆم وبۆ ئێوەی خواپەرەست داوای لێخۆشبون دەکەم.

وتیان: شایەتی دەدەیت عوسمان بەستەمکاری کوژرا؟ وتی: نا، دەڵێم ستەملێکراو کوژرا نەك وەك ستەمکار.

ئەو دوانە وتیان: هەر کەس باوەڕ نەهێنێت ئەو بەستەم کوژراوە ئێمە لێی

بێزارین. گەڕانەوە.

عەلی وتی: تۆ ناتوانیت مردوەکان زیندو بکەیتەوە و ناتوانیت قسەیەك لەکەڕەکان حاڵی بکەیت بەتایبەت ئەوانەی لەراستی و دروستی رادەکەن. هەروەها ناتوانێت رێگری بکەیت لەگومڕایی کوێرەکان. تەنیا دەتوانیت ئەو کەسانە رزگار بکەیت کەباوەڕ بەنیشانەکانی ئێمە بکەن و ملکەچی راستی و دروستی بن. (نمل/٢٧/٨٠-٨١). دواتر بەهاوەڵانی خۆی وت. ئاگادار بن ئەوان لەخراپەکاری و شوێن کەوتنی خراپە، لەئێوە لەفەرمانبرداری راستی و دروستی و تەسلیم بون بەخواکەتان بەهێزتر بن.

لەم کاتەدا عامر کوڕی قەیسی حێزمێری تایی لەسەر ئاڵای صەفین لەگەڵ عودەی کوڕی حاتەمی تایی شەڕی کرد. حێزمێریەکان خەڵکانی عامر کوڕی قەیس بون و لەبەنی عودەی کەخەڵکی عودەی کوڕی حاتەم بون، ژمارەیان زیاتر بو. عەبداللە کوڕی خەلیفەی بەوەلانی لای عەلی وتی: ئەی بەنی حێزمێر، ئایا دژی عودەی شەڕ دەکەن. ئایا لەنێوان ئێوە و باوکانتان کەسێکی وەك عودەی و باوکی دەست دەکەوێت. ئایا ئەو پاسەوانەی شارەکان و پارێزەری ئاو لەرۆژی ئاودانیدا نیە؟ ئایا کوڕی زەی ئەلێر باغ نیە؟ کوڕی بەخشندەترین پیاوی عەرەب، تالآنکەری سامانەکەی خۆی بۆ هەژاران، پەنادەری بێ پەناکان، دور لەفێڵ و تاوان و گوناحکاری و ترسەنۆکی ترسەنۆکەکان نیە؟ لەناو باوکانتان یەکێکی وەك ئەو و لەناو خۆتان یەکێکی وەك عودەی نیشان بدەن. ئایا لەئیسلامدا لەپێشترینی ئێوە نیە؟ مەگەر ئەو نەبو بەنوێنەرایەتی خەڵك رۆشتە لای پێغەمبەر؟ مەگەر ئەو فەرماندەی ئێوەی لەرۆژی نەخلیە، قادسیە، مەداین، جەولولا، نەهاوەند و شەڕی شوشتەر نەبو؟

عەلی وتی: ئەی کوڕی خەلیفە تەواوی بکە. دوبارە عەلی وتی: دەبێت خەڵکی تەی کۆببنەوە. ئەوان هاتن. پرسی: لەوشەڕانەدا کێ سەرکردەی ئێوە بو؟

وتیان: عودەی.

کوڕی خەلیفە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران لەوان بپرسە ئایا لەسەرکردایەتی ئەو رازی نین. عەلی پرسی و وتیان: رازین. عەلی وتی: عودەی بۆ هەڵگرتنی ئاڵا شیاوترە. عودەی ئاڵاکەی هەڵگرت.؟ کاتێك رۆژگاری حجر کوڕی عودەی گەیشت، زیاد کوڕی نوبییە بەدوای عەبداللە کوڕی خەلیفە گەڕا تا لەگەڵ حجر رەوانەی بکات. ئەو

ڕۆشتە (جەبەلەین) و مژدەی بەعودەی دا دەیگەڕێنێتەوەو ولەم کارەدا ناوبژیوانی دەکات. ئەم کارە خایاندی و ئەمەی وت:

| | |
|---|---|
| اتنسى بلائى سادرا يا ابن حاتم | عشية ما اغنت عديك خذمرا |
| فدافعت عنك القوم حتى تخاذلوا | و كنت انا الخصم الالد العذورا |
| فولوا و ما قاموا مقامى كانما | راونى ليثا بالابائة مخدرا |
| نصرتك اذخام القريب و ابعد الـ | ـبعيد و قد افردت نصرا مؤزرا |
| فكان جزائى ان اجرر بينكم | سحيبا و ان اولى الهوان و اوسرا |
| و كم عدة لى منك انك راجعى | فلم تغن بالميعاد عنى حبترا |

یانی: ئەی کوڕی حاتەم، ئایا ئەزمونی من لەبیر دەکەیت بێ ترس تۆم پاراست؟ ئەمە لەو کاتەدا بو خەڵکی عودەی نەیانتوانی لەبەرابەر حێزمێریەکان کارێك بکەن. ئەو خەڵکانەم لەدەوروبەری تۆ دورخستەوە بەو شێوەی دەستیان لەهاوکاری کردنی یەکتر هەڵگرت و بومە دوژمنی سەرسەختی گیان گر. ئەوان گەڕانەوە و نەیانتوانی لەبەرابەر من خۆڕاگری بکەن، وەك بڵێی منیان بەشێری ژیان زانی کە لەسەراپەردەیەك لەشکۆ ورازی نەبون بەستەم ژیان بەسەر دەبەم. لەکاتێکدا هاوکاری تۆم کرد نزیکەکانت پشتیان تێکردیت و بەراکردن دورکەوتنەوە و من هاوکاریەکی گیانانەم پێشکەش بەتۆ کرد. پاداشی من ئەوەبو زنجیر وبەند بکرێم و لەناو نێوە بۆ ئەم لاولا دورم خەنەوە وسوکم بکەن و گرفتار. چەندە مزگێنی و مژدەت بەمندا کەدەمگەڕێنیتەوە بەڵام لەسەر بنەمای بەڵێنەکانی خۆت نەتوانی ڕێویەکی ریسواییش لەمن دور بکەیتەوە.

بەخواستی خوا ئاماژە بەهەموی ئەم داستانە دەدەین.

کاتێك مانگی محەڕەم تێپەڕی کرد، عەلی فەرمانی بەجارچیەك دا و جاڕیدا: ئەی خەڵکانی شام، سەروەری باوەڕداران دەڵێت: تا ئەو کاتەی پێویستی کرد مۆڵەتم پێدان بۆ سەر ڕێگەی راستی و دروستی بگەڕێنەوە بەڵام نێوە لەیاخی بون و بێدادگەری خۆتان نەگەڕانەوە و بانگەوازەکەی منتان بێ وەڵام هێشتەوە. من بەشێوەیەکی گشتیگیر و بەرابەر هەموتانم ئاگادار کردەوە و خوا دەغەڵکارەکانی خۆش ناوێت.

خەڵکانی شام رویان کردە سەرکردە و فەرمانەدەکانی خۆیان. معاویە لەگەڵ عەمرۆ

کوڕی عاص هاتەدەر و سوپاکەی خۆیان بۆ چەندین دەستە دابەش کرد و بۆ شەڕ ئامادەیان کردن. عەلیش ئەم کارەی کرد. بەخەڵکی وت: شەڕ دەست پێمەکەن تا ئەوان شەڕ دەستپێبکەن چونکە ئێوە بەڵگەی بەهێزتان هەیە و دەسپێش نەختسی ئێوە بۆ شەڕ خۆی بەڵگەیەکی دیکەیە. کاتێك ئەم کەمتیارانەتان شکەستدا، هەڵاتوان مەکوژن، بریندارەکان ئازار مەدەن، شەرمی هیچ کەسێك روت مەکەن، گوێچکە و لوت و ئەندامەکانی جەستە مەبڕن، مەڕۆنە هیچ ماڵێك، درەمێك لەسامانی ئەوان هەڵمەگرن، ژنەکانین مەڕەنجێن (هەرچەندە ئابڕوی ئێوە ببەن و جوێن بەسەکردە و فەرماندەکانتان بدەن) چونکە توانایی ئەوان کەمە و گیانیان ناسکە. عەلی کوڕی ئەبی تالب پێش هەر شەڕێك ئەم پێشنیارانەی دەکرد. ئەوهاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ هاندا و وتی: ئەی بەندەکانی خوا، لەخوا بترسن، چاوتان دابخەن، دەنگتان نزم بکەنەوە، کەم قسە بکەن و هەمو هێزی خۆتان بۆ شەڕ و هەوڵدان و تێکۆشان و لەناوبردنی خراپەکاران بەکار ببەن. خۆڕاگر بن و بەردەوام بیری خوا بکەنەوە لەوانەیە لەرزگار بوان بن( انفال /٤٥/٨). شەری یەکتر مەکەن تا شکۆ و گەورەییتان لەناو نەچێت و سەرنەکەتوو نەبن. خۆڕاگربن چونکە خوا خۆڕاگرانی خۆش دەوێت (انفال/٤٦/٨). ئەی خوایە، بارانی خۆڕاگری بەسەر ئەوان ببارێنە وسەرکەوتن وپاداشێکی گرانیان پێ ببەخشە.

عەلی لەبەرەبەیانی رۆژی شەڕ ئەمانەی کردە فەرماندەی سوپاکەی: ئەشتەری نەخەعی وەك فەرماندەی سوارەکانی کوفە، سەهل کوڕی حەنیف فەرماندەی سوپای بەسرە، عەمار کوڕی یاسر فەرماندەی پیادەکانی کوفە، قەیس کوڕی سەعد فەرماندەی پیادەکانی بەسرە و مەسعەر کوڕی فەدەکی کردە فەرماندەی قورئان خوێنەکانی بەسرە و کوفە. ئاڵاکەی بەهاشم کوڕی عەتبەی مێرقال سپارد. معاویە ئەمانەی کردە سەرکردە: باڵی راستی سوپاکەی کوڕی زی ئەلکەلاعی حەمیری، باڵی چەپ حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری، فەرماندەی پێشەنگەکان ئەبوئەعوەری سەلەمی. فەرماندەی سوارەکانی دەمەشق عەمرۆ کوڕی عاص، فەرماندەی پیادەکانی دەمەشق موسلیم کوڕی عەقەبەری موری و فەرماندەی هەموان زەحاك کوڕی قەیس. دەستەیەك لەخەڵکانی شام بۆمردن بەیعەتیان کرد و وەك وشترەکان ئەژنۆی خۆیان بەدەستارەکانەوە بەست.

شەڕکەران پێنج ریز بون. لە یەکەم رۆژی مانگی صەفەر/ ١٩ ژوئیە ٦٥٧ زایینی بۆ شەڕ ریزیان بەست. فەرماندەی خەڵکانی کوفە لەدەست ئەشتەردابو و فەرماندەی خەڵکانی شام لەدەستی حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری. ئەو رۆژە بەسەختی شەڕیان کرد و تەواوی رۆژیان بەشەڕ بەسەر برد و داخی دڵی خۆیان لەیەك سەند. لەرۆژی دوەم /٢٠ ژوئیە ٦٥٧ زایینی عاسم کوڕی عەتەبە هاورێ لەگەڵ سوارەکان وپیادەکان هاتەدەر. لەخەڵکانی شام ئەبوئەعوەری سەلەمی روبەروی بویەوە. ئەورۆژەیان بەشەڕ بەسەر برد و دواتر گەڕانەوە. لەرۆژی ٣ /٢١ ژوئیە ٦٥٧ زایینی عەمار کوڕی یاسر هاتەدەر وعەمرۆ عاصیش . هەردولا بەسەختی و قورسی هەرچی زیاتر شەڕیان کرد. عەمار وتی: ئەی خەڵکان عێراق، ئایا دەتانەوێت سەیری کەسێك بکەن کەشەڕی خوا وپێغەمبەرەکەی کرد و هاوکاری بەبتپەرستەکان بەخشی وبەرێزی کردن؟ کاتێك زانی خوا دینەکەی خۆی دەسەپێنێت وپێغەمبەرەکەی سەرکەوتو دەکات، هاتە لای پێغەمبەر بەهەمان شێوە دەزانن ترسابو نەك ئەوەی خوازیاری ئیسلام بێت. دواتر ئەو کاتەی پێغەمبەر مرد ئەم پیاوە خراپەکارە بەردەوام بۆ دوژمنایەتی کردنی موسوڵمانان و تاوان و خراپەکاری دەناسرا. لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەن و تا ئەتوانن شەڕی لەگەڵ بکەن.

عەمار بەفەرماندەی سوارەکان زیاد کوڕی نەزری وت: هێرش بکەرە سەر خەڵکانی شام. ئەو هێرشی کرد و خەڵك روبەروی بونەوە. عەمار هێرشی برد و پاشەکشێ بەعەمرۆ کوڕی عاص هێنا. لەو رۆژەدا زیاد کوڕی نەزر لەگەڵ براکەی خۆی بەناوی عەمرۆ کوڕی معاویە لەبەنی مونەتفیق روبەرو بویەوە. کاتێك روبەروی یەك بونەوە، یەکتریان ناسی و هەردوکیان پاشەکشێیان کرد و خەڵك گەڕانەوە. بەیانی ئەو رۆژە محەممەد کوڕی عەلی (حەنیفە) هاتەدەر و عوبەیداللە کوڕی عومەری خەتاب روبەروی بویەوە. هەردوکیان سوپایەکی گەورە هاورێیەتی دەکردن. ئەوان تا ئەو جێگەی توانیان شەڕیان کرد. عوبەیداللە کەسی بۆ لای کوڕی حەنیفە نارد و داوای شەڕی دەستەویەخەی لەگەڵ کرد. محەممەد روبەروی بویەوە. عەلی مایینەکەی خۆی غاردا و رێگەی لەکوڕەکەی گرت و داوای لەعوبەیداللە کرد روبەروی خۆی ببێتەوە. عوبەیداللە گەڕایەوە. محەممەد بەباوکی وت: ئەگەر رێگەت لێ نەدەگرتم، هیوادرابوم

بیکوژم. دوبارە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، چۆن بۆ شەڕی ئەم خراپەکارانە هاتویتەدەر، سوێند بەخوا بەدوری دەزانم تەنانەت دەستت بۆ باوکی درێژ کردبێت.

عەلی وتی: کوڕم، تەنیا بەچاکە باسی باوکی بکە.

خەڵك گەڕانەوە. عەبداللە کوڕی عەباس لەڕۆژی پێنجەم /٢٣ ژوئیە ٦٥٧ زایینی هاتەدەر. وەلید کوڕی عەقەبە روبەروی بویەوە و شەڕێکی قورس دەستپێکرد. وەلید جوێنی بە کوڕانی عەبدولموتەلیبدا و کوڕی عەباس داوای روبەروبونەوەی لێکرد بەڵام وەلید رازی نەبو. کوڕی عەباس تا ئەو جێگەی دەیتوانی شەڕی کرد. لەڕۆژی شەشەم /٢٤ ژوئیە ٦٥٧ زایینی قەیس کوڕی سەعدی ئەنساری بۆ شەڕ رۆشتەدەر و کوڕی زی ئەلکەلاع روبەروی بویەوە. شەڕێکی قورسیان کرد و دواتر گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. دواتر سێ شەممە (٧ صەفەر/٢٥ ژوئیەی ٦٥٧ زایینی) گەڕایەوە و ئەشتەر بۆ شەڕ هاتەدەر و حەبیب کوڕی موسلیمەی فێهری روبەروی بویەوە. شەڕێکی قورسیان کرد و لەکاتی نیمەڕۆ گەڕانەوە.

عەلی وتی: تا کەی نابێت شەڕی سەراسەری ویەکلاییکەرەوە دەست پێبکەین؟ ئێوارێی سێ شەممە و چوار شەممە لەناو خەڵکدا قسەی کرد، سوپاسی خوای کرد و وتی: سوپاس بۆخوا چونکە ئەوەی بیپچڕێنێت، پەیوەست نابێتەوە و ئەوەی بەهێزی بکات، کەس ناتوانێت هێزی لێ بستێنێتەوە. ئەگەر خوا دەیخواست تەنانەت دوان لەنافرێنراوەکانی رێگەی ناسازگاریان نەدەگرتەبەر و هەموی ئەم ئۆمەتە بۆ شەڕی یەك هەڵنەدەستان وئەو کەسەی پێگەیەکی نزمتر هەیە، لەپێشی کەسانی دیکەی پشت گوێ نەدەخست. ئەمە چارەنوسە ئێمەی بۆروبەرو بونەوەی ئەم خەڵکانە کۆکردۆتەوە. خوا دەمانبینێت و قسەکانمان دەبیستێت. ئەگەر دەیخواست، لەتۆڵەسەندنەوە پەلەی دەکرد تا درۆی ستەمکار ئاشکرا ببێت و راستی و دروستی پێگەی خۆی بەدەست بێنێتەوە. بەڵام ئەم جیهانی کردە شوێنی کار و کردەوەکان و ئەو جیهانەی کردە جێگەی ئارامشێکی هەمیشەیی. تا ئەوانەی خراپەیان کرد، سزا بدرێت وئەوانەی رێگەی چاکەیان گرتەبەر، پاداشتیان پێ ببەخشرێت (نجم/٣١/٥٣) ئاگادار بن بەیانی روبەروی ئەم خەڵکانە دەبنەوە. ئەمشەو زیاتر بەئاگا بمێننەوە و زیاتر نوێژ بخوێنن و تا دەتوانن قورئان بخوێنن ولەخوا بۆ سەرکەوتن و خۆڕاگری

بپارێنەوە و بەهەوڵدان و دورئەندێشی روبەروی ئەوان ببنەوە و بەردەوام راستگۆبن. خەڵك پەلاماری كەرەستەكانی شەڕی خۆیاندا و راستیان كردەوە. كەعب كوڕی جەمیل لای ئەوان تێپەڕی كرد و وتی:

اصبحت الامة فى امر عجب          و الملك مجموع غدا لمن غلب

فقلت قولا صادقا غير كذب          ان غدا تهلك اعلام العرب

یانی: ئۆمەت گرفتارێكی چارەنوسێكی سەیر بوە، بەیانی پاشایەتی بۆ كەسێك دەبێت كەسەركەوتن بەدەست بێنێت. قسەیەكی راستم كرد و درۆی تیا نیە، بەیانی گەورەكانی عەرەب لەناو دەچن.

عەلی شەو تابەیانی بەرازاندنەوە و ساماندانی سوپاكەی خۆی سەرقاڵ بو. معاویە لەگەڵ خەڵكانی شام روبەرویان بونەوە. عەلی سەبارەت بەهۆزەكانی شام پرسیاری كرد و شوێنەكانی ئەوانی ناسیەوە. بەئەزدیەكانی وت: شەڕ لەگەڵ ئەزد بكەن، بەهەر هۆزێكی وت لەگەڵ هۆزی هاوتای خۆی لەشام شەڕ بكات مەگەر ئەو هۆزەی هاوتای خۆی لەشامدا نەبو و لەبەر ئەمە بۆ شەڕ لەگەڵ هۆزێكی دیكە دەستنیشانی كرد وەك بوجەیلە كەخەڵكەكەی كەم بون وئەوانی رەوانەی شەڕی لەخیمەكان كرد.

خەڵك لەرۆژی چوارشەممە (٨صەفەر/ ٢٦/٢٧ ژوئیە ٦٥٧ زایینی) لەشوێنی خۆیان هەستان و شەڕێكی قورسیان دەست پێكرد و دەمەوئێوارێ گەڕانەوە. عەلی نوێژی بەیانی لەتاریكیدا خوێند و خەڵكی بۆ شەڕی شامیەكان رەوانە كرد. ئەو بۆ شەڕ پێشكەوت و ئەوان دوایكەوتن. فەرماندەی باڵی راستی سوپاكەی عەبداللە كوڕی بودەیل كوڕی وەرقای خوزاعی بو و فەرماندەی باڵی چەپی عەبداللە كوڕی عەباس. قورئان خوێنەكان لەژێر فەرماندەیی سێ كەسدا بون: عەممار كوڕی یاسر، سەعد كوڕی قەیس و عەبداللە كوڕی بودەیل. خەڵكان لەژێر ئاڵاكانی خۆیان ولەجێگەكانی خۆیان سەرقاڵ بون. عەلی هاورێ لەگەڵ خەڵكانی مەدینە لەناو دڵی سوپاكەدا بو و خەڵكانی كوفە وبەسرە دەوریان گرتبو. پێشتر هاورێكانی لەخەڵكانی مەدینە و ئەنسار بون. ژمارەیەك لەخەڵكانی خوزاعە و كەنانە و كەسانیتر هاورێیەتیان دەكرد و ئەمە جگە لەخەڵكانی مەدینە بون. عەلی دەستی بەپێشڕەوی كرد.

معاویە خێوەتێكی گەورەی هەڵكرد و جل وبەرگی گرانبایی پێوە هەڵواسی و

زۆربەی ئەو خەڵکانە لەشام کەبەیعەتیان لەگەڵ کردبو، دەوری خێوەتەکەی ئەویان گرت.

عەبدالله کوڕی بودەیل لەگەڵ باڵی راستی سوپای عەلی هێرشی کردەی سەر باڵی چەپی سوپای معاویە بەسەرکردایەتی حەبیب کوڕی موسلیمەی فێهری و تا کاتی نیمەڕۆ تا نزیك خێوەتەکەی معاویە پاشەکشێی پێکردن. عەبدالله کوڕی بودەیل هاورێکانی خۆی بەم وتە ئاگرینانە بۆ شەڕ هاندەدا: ئاگادار بن، معاویە خوازیاری کارێکە شیاو نیە بۆی و لەگەڵ هەلگرانی راستی و دروستی رێگەی ناسازگاری گرتۆتەبەر. شەڕی لەگەڵ کەسێك دەستپێکردوە هاوشێوەی خۆی نیە، خراپە و خراپەکاری هەڵکردوە تا راستی و دروستی پێ سەرکوت بکات، لەگەڵ بیابان نشینەکان و دەستەیەك لەخەڵکان هێرش دەکاتەسەر ئێوە کەگومراپی بۆ ئەوان رازاندۆتەوە و تۆوی ئاژاوەی لەدڵی ئەواندا چاندوە و راستیەکانی لەوان شاردۆتەوە و خراپەی زیاتری بەسەر ئاخ و دەرونی ئەوان سەپاندوە. لەگەڵ ستەمکاران و بێدادگەران شەڕ بکەن و لەهیچ مەترسن. کوشتاریان بکەن و خوا ئەوان لەسەر دەستی ئێوە ئەشکەنجە بکات و ریسوایان بکات و سەرکەوتن بەئێوە ببەخشێت و دڵی باوەڕداران بحەوێنێتەوە (تۆبە/٩/١٤).

عەلی بەوتە دڵنشینەکانی خۆی هاوەڵانی بۆ شەڕ هاندەدا: ریزەکانی خۆتان هاوشێوەی دیوارێك لەپۆڵای سورەوەکراو سامان بدەن، زرێپۆشەکان لەپێشەوە بڕۆن، بێ زرێکانە لەدواوە، دیانەکانی خۆتان جیڕ بکەنەوە چونکە بەمشێوەیە ئاسانتر دەتوانن سەر لەجەستەکان جیا بکەنەوە. بەدەوروبەردا بسوڕێنەوە چونکە باشتر دەتوانن ڕمەکان بپارێزن، چاوەکانتان دابخەن چونکە شکۆی ئێوە بەهێزتر و دڵتان ئارامتر دەکات، دەمنگتان بمرێنن چونکە سەرنەکەوتن باشتر دەتارێنێت و لەگەڵ قورسی زیاتر پەیوەستە. ئاڵاکانی خۆتان بەبەهێزی رابگرن، پاشەکشێ بەئاڵاکان مەکەن و تەنیا بەدەستی پیاوە بوێرەکانی خۆتان بسپێرن، داوای هاوکاری لەراستی و خۆڕاگری بکەن چونکە خۆڕاگری بارانی سەرکەوتن بەسەر ئێوەدا دەبارێنێت.

یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی هەستا و بەم وشانە خەڵکی بۆ شەڕ دژی شوێنکەوتوانی دێو هاندا: موسوڵمان ئەو کەسەیە دین وبڕوای راست بێت. سوێند

بەخوا ئەم خەڵكە بۆ سەقامگیر كردنی دینێك شەڕمان لەگەڵ دەكەن كە بەفیڕۆمان دابێت و نە بۆزیندو كردنەوەی راستی. ئەوان تەنیا بۆ بەگەیشتن بەمەبەستەكانی ئەم دنیا شەڕ دەكەن تا بێنە سەر كار وببنە پاشا دیكتاتۆرەكانی جیهان. ئەگەر بەسەر ئێوەدا سەركەون، كەسانێكی وەك وەلید و سەعید و كوڕی عامری گومڕا دەكەنە فەرمانڕەوایی ئێوە كە لەیەك دانیشتندا بەئەندازەی خوێنبایی خۆی و باوكی و باوگەورێی دیاری دەبەخشێت و دواتر دەڵێت: ئەمە هی منە و گوناح نیە، وەك بڵێی میراتی دایك و باوكیەتی بەم وبەوی دەبەخشێت و نازانێت ئەمە سامانی خوایە و خواوەند لەسێبەری شمشێر و ڕمەكان بەئێمەی بەخشیوە. ئەی بەندەكانی خوا، لەگەڵ داروودەستەی ستەمكاران شەڕ بكەن چونكە ئەگەر بەسەر ئێوەدا سەركەون ئەو دنیا و ئەم دنیاتان بەفیڕۆ دەدەن چونكە بەباشی دەیانناسن و ئەزموونتان لەگەڵیان هەیە. سوێند بەخوا تا ئەمڕۆ جگە لەزیان هیچ كارێكی دیكەیان لێ نەوەشاوەتەوە.

عەبدالله كوڕی بودەیل فەرماندەی باڵی راست بەسەختی شەڕی لەگەڵ ئەوان كرد تا خۆی گەیاندە خێوەتەكەی معاویە. ئەوانەی بۆ مەرگ لەگەڵ معاویە بەیعەتیان كردبو، لەترسی گیان پەنایان بۆ برد و معاویە فەرمانی پێدان لەبەرابەر هێرشی باڵی راستی سوپاكەی عەلی بەفەرماندەیی كوڕی بودەیل خۆڕاگری بكەن.

معاویە كەسێكی بۆ لای حەبیب كوڕی موسلیمەی فیهری فەرماندەی باڵی چەپی سوپاكەی خۆی رەوانە كرد و ئەو لەگەڵ ئەوان و خەڵكانی دیكە هێرشی كردە سەر باڵی راستی سوپاكەی عەلی و شكەستی پێهێنان. عێراقیەكان لەباڵی راست ڕەمیان كرد بەرادەیەك جگە لەبودەیل و دوسەد یا سێسەد كەس لەقوڕئان خوێنەكان كەببونە پشتیوانی یەكتر، كەس نەمایەوە. خەڵك رایان كرد. عەلی فەرمانی بەسەهل كوڕی حەنیف دا تا هاورێكانی خۆی لەخەڵكانی مەدینە بۆ پێشەوە ببات. دەستەیەكی فراوان لەخەڵكی شام روبەرویان بونەوە و شەڕیان دەست پێكرد تا ئەوەی ئەوانیان لەلای باڵی راست لەجووڵە خست. لەنێوان باڵی راست تا جێگەكەی عەلی لەناو دڵی سوپا خەڵكانی یەمەن جێگەیان گرتبو. كاتێك شەڕكەرانی باڵی راست بڵاوەیان لێكرد، شكەست لەپێگەی عەلی نزیك كەوتەوە. عەلی هێرشی كردە سەر باڵی چەپ و موزەریەكان پاشەكشێیان كرد و خەڵكانی رەبیعە خۆڕاگریان كرد. كاتێك عەلی ئاهەنگی باڵی

چەپی کرد، کوڕەکانی حەسەن و حسێن و محەممەد هاورێیەتیان دەکرد وبارانی تیر وەك تەرزە دادەباری و لەدەوری سەر و سینەی ئەو تێپەڕیان دەکرد. هەرکام لەکوڕەکانی هەوڵی دەدا خۆی بکاتە قەڵغان بۆی و بیگەڕێنێتەوە. ئەحمەر کۆیلەی ئەبو سوفیان یا عوسمان ئەوی بینی و روبەروی بویەوە. کیسان کۆیلەی عەلی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەحمەر غاریدا. ئەوان دوجار بەشمشێر لەیەکیان دا و سەرئەنجام ئەحمەر کیسانی کوشت. عەلی یەخەی زرێکەی ئەحمەری گرت و بۆ لای خۆی راکێشا وئەوی بەرز کردەوە و بەتوندی هەرچی زیاتر کێشای بەزەویدا بەشێوەیەك هەمو جمگە و ئێسقانەکانی شکا. خەڵکانی شام لەعەلی نزیك کەوتنەوە بەڵام ئەم نزیك کەوتنەوە تەنیا بوە هۆی پێشڕەوی کردنی عەلی. حەسەنی کوڕی پێی وت؟ چ زیانێك دەبینیت ئەگەر بۆ لای ئەم دەستە لەهاورێکانت بگەڕێیتەوە؟

وتی: کوڕم، سەرەتایەك بۆ مەرگی باوکت هەیە و لێی تێپەڕ نابێت، نەهەڵاتن خاوی دەکاتەوە و نەپەلە کردن خێراتری دەکات. سوێند بەخوا باوکت ترسی ئەوەی نیە بڕواتە ناو قوڕگی مەرگ یا مەرگ هێرشی بکاتەسەر. کاتێك گەیشتە خەڵکی رەبیعە، بەدەنگێکی بەرز و بوێرانە پرسیاری لەپێشهاتەکان کرد: پرسی: ئەم ئاڵایانە هی کێیە؟

وتیان: خەڵکی رەبیعە.

وتی: ئاڵای خەڵکانێکە خوا ئەوانی هێشتۆتەوە وخۆڕاگری بەوان بەخشیوە و هەنگاوی بەهێز کردون. فەرمانی بەحوزەین کوڕی مونزەردا: ئەی جوامێر، ئایا ئاڵاکەی خۆت یەك گەز بۆ پێشەوە نابەیت؟

وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا دەگەز. ئەوەندە بۆ پێشەوە ڕۆیشت کەعەلی وتی: بەسە، لەسەر جێگەکەت بمێنەرەوە.

کاتێك عەلی گەیشتە خەڵکی رەبیعە، هاواری کرد: ئەی خەڵکانی رەبیعە، ئەگەر سەروەری باوەڕداران لەناو ئێوە زیانی بەرکەوێت و لەم کاتەدا یەك کەس لەئێوە زیندو بێت، لەناو عەرەبەکان ریسوا دەبن. خەڵکانی رەبیعە بەچەشنێك شەڕیان کرد کەپێشتر هاوشێوەی نەبینراوە. لەبەر ئەمە عەلی وتی:

لمن راو يقدمها فى الموت حتى يزيرها    حياض المنايا تقطر الموت و الدما

اذقنا ابن حرب طعننا و ضرابنا    يا سيافنا حتى تولى و احجما

| | |
|---|---|
| جزى الله قوما صابروا فى لقائهم | لدى الموت قوما ما اعف و اكرما |
| و اطيب اخبارا و اكرم شيمة | اذا كان اصوات الرجال تغمغما |
| ربيعة اعنى انهم اهل نجدة | و باس اذا لاقوا خميسا عرمرما |

بۆ پێشەوەی دەبات تا دەگاتە ئاوبەستەکانی مەرگ، لەوێ کە لەئاسمان و زەوی زیان و خوێن دەبارێت. ئازاری ڕم و شمشێرمان بەکوری حەرب چێشت بەچەشنێك هەڵهات و دەستی لەشەڕ کردن هەڵگرت. خوا پاداشتی چاکەی ئەو خەڵکە بداتەوە کە لەروبەرو بونەوە لەگەڵ مەرگ خۆڕاگریان کرد. چەندە داوێن پاك و خەڵکانێکی بەرێزن. دەنگێکی لەهەموان پاکتریان هەیە و کردەوەیەکی رێزدارانەتر، ئەمە لەکاتێکدایە لەترسی مەرگ، ئاوازی پیاوان لەناو قوڕگ دەشکێنێت. باسی رەبیعە دەکەم کەکاتێك روبەروی سوپایەکی گەورە و بناغەروخێن دەبنەوە، پیاوەتی و جوامێری و رێزداری لەخۆیان نیشان دەدەن.

ئەشتەر لای ئەو تێپەڕی. ئەو دەیویست بەرەو شوێنی زیان لەلای باڵی راست بڕوات و بەخێرایی بەرەو ئەو شوێنە دەڕۆشت. بینی عەلی ئاهەنگی باڵی چەپی سوپای دوژمنی هەیە. عەلی هاواری کرد: ئەی مالك؟

ئەشتەر وەڵامی دایەوە: گیانم بەقوربانت بێت ئەی سەروەری باوەڕداران.

عەلی وتی: بڕۆ لای ئەم خەڵکە وپێیان بڵێ: لەمەرگ بۆ کوێ رادەکەن؟ نەدەتوانن مەرگ دەستەمۆ بکەن و نەدەتوانن شانازی بەژیانی هەمیشەییەوە بکەن.

ئەشتەری نەخەعی بەرێکەوت و فەرمانەکانی عەلی بەوان گەیاند. دواتر هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، من ئەشتەرەم، لەدەوری من کۆببنەوە. دەستەیەك دوای کەوتن و دەستەیەك بەرێگای خۆیاندا ڕۆشتن. هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، شەڕکردنی ئەمڕۆتان نەشیاو بو! پیاوانی مەزحێج بێننە لای من و تایبەتیان بکەن بەمن. مەزحێجیەکان لەدەوری کۆبونەوە. بەوانی وت: نەخوای خۆتان رازی کرد و نە لەشەڕ لەگەڵ دوژمن رێزتان لێگرت. ئێوە منالی شەڕن! چۆن دەکرێت ئەم هەڵس و کەوتە لەئێوە بوەشێتەوە؟ ئێوە خاوەندی هێرشەکان، جوامێرانی بەرەبەیان، سوارکارە ئازاکان، مەرگی شەڕکەران و مەزحێجیەکانی گۆڕەپانن و لەتۆڵە سەندنەوە کەس پێش ئێوە ناکەوێت و ناتوانێت خوێنتان بەفیڕۆ بدات. ئەوەی ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن،

بەیانی دەگێڕنەوە، جوان تێفکرن و بەراستی شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەن چونکە خوا بەردەوام لەگەڵ راست کردارانە. سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، هیچ کام لەخەڵکانی شام بەئەندازەی باڵی مێشولەیەك دینیان نیە. ڕەشی لەروخساری من بسڕنەوە تا خوێن هێرشی بۆ بێنێت. لەسەر ئێوە بێت ئەم خێوەتە گەورەیە بکەنە نیشانەی خۆتان. سوێند بەخوا ئەگەر خواوەند بیدرێت، ئەو کەسانەی لەدەوری کۆبونەتەوە، لەت لەت دەبن و رادەکەن. مەزحیجیەکان وتیان: بەشێوەیەك کردار دەکەین دڵخوازی تۆ بێت. ئەو بەرەو فراوانی خەڵك لای باڵی راست غاریدا و روی کردە ئەوان و بەردەوام دەیگەڕاندنەوە. گەنجانێك لەخەڵکی هەمەدان پێشوازیان لێکرد و ئەمان لەو رۆژەدا هەشسەد پیاوی شەڕکەر بون. بەرادەیەك لەباڵی راست بوێرانە شەڕیان کردبو کە سەد و هەشتا پیاو لەوان کوژرابو هاورێ لەگەڵ یانزە سەرکردە. یەکەمیان زەیب کوڕی شورەیح و دوایینیان شورەحبیل، مەرسەد، هۆبەیرە، یەریم، وسومەیر هەمویان منداڵەکانی شورەیح. دواتر عێمیرە کوڕی بەشیر و ئەوسا حەرەس کوڕی بەشیر ئاڵایان لەدەست گرت و هەردوکیان کوژران. دوای ئەوان سوفیان کوڕی زەید و عەبداللە کوڕی زەید و بەکر کوڕی زەید ئاڵاکەیان بەدەستەوە گرت و کوژران. وەهب کوڕی کورەیب ئاڵاکەی هەڵگرت و لەگەڵ خەڵکەکەی بەرەو شەڕ بەرێکەوتن و بەردەوام دەیانوت: خۆزگە بەژمارەی ئێمە پیاوانێك لەعەرەب دەبون لەسەر مەرگ پەیمانیان دەبەست و دواتر رومان دەکردە گۆڕەپان و نەدەگەڕاینەوە تا سەرکەوتنمان بەدەست دەهێنا یا دەکوژراین! ئەشتەر قسەی ئەوانی بیست و وتی: من لەگەڵ ئێوە پەیمان دەبەستم کە نەگەڕێمەوە یا سەرکەوتن بەدەست دێنین یا دەکوژرێین. دواتر رۆشتە ناو ریزی ئەوان. کەعب کوڕی جوبەیل لەمبارەوە وتی:

وهمدان زرق تبتغي من تحالف

یانی: هەمەدانیەکان بۆ هێرش بردن ساف و پاکن و بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن تا پەیمانی مەرگی لەگەڵدا ببەستن.

ئەشتەر بەرەو باڵی راست غاریدا و خەڵك رویان تێکرد و خەڵکانی بەسرە و هاوشێوەکانیان گەڕانەوە. ئاهەنگی هیچ دەستەیەکی شەڕکەری نەکرد مەگەر ئەوەی دەستی بەسەردا گرت و هیچ سوپایەك مەگەر ئەوەی پاشەکشێی پێ کرد. بەم کارەوە

سەرقاڵ بو تا ئەوەی زیاد کوڕی نەزری حارسیان بەبرینداری لای ئەو تێپەڕاند و بەرەو لەشکرگەیان دەبرد. هۆکارەکەی ئەوە بو عەبدالله کوڕی بودەیل و هاورێکانی لەباڵی راست کەوتبونە ناو بۆسەی دوژمن و رێگەی دەربازبونیان نەبو. لەبەر ئەمە زیاد کوڕی نەزری حارسی بۆ هاوکاری ئەوان ڕۆیشت و ئاڵاکەی خۆی بۆ شەڕکەرانی باڵی راست هەڵکرد و ئەوان لەشوێنەکانی خۆیان خۆڕاگریان کرد و زیاد ئەوەندە شەڕی کرد تا لەخاك وخوێندا تلایەوە. دواتر لای یەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی تێپەڕین کەبەرەو لەشکرگە دەبرا. دوای ئەوەی زیاد کەوتە سەرزەوی، یەزید ئاڵاکەی خۆی بۆ شەڕکەرانی باڵی راست هەڵکرد و ئەوەندە شەڕی کرد تا کەوتە سەر زەوی. کاتێك ئەشتەر ئەوی بینی، وتی: سوێند بەخوا ئەمە خۆڕاگری چاکەکاران و کرداری رێزدارانە. ئایا پیاو شەرم نایگرێت بگەڕێتەوە و نەکوژرێت یا نەکەوێتە لێواری هەڵدێری مەرگەوە؟ ئەشتەر تا ئەو جێکەی دەیتوانی بوێرانە شەڕی کرد و حەرەس کوڕی جومەهانی جوعفی خۆی پێگەیاند و شان بەشانی ئەو شەڕی کرد. ئەو و پەیوەست بوان بەو (ئەشتەر و هاورێکانی) کەگەڕابونەوە، ئەوەندە شەڕیان کرد شکەستیان بەشامیەکان هێنا. ئەشتەر لەنێوان نوێژی عەسر و ئێوارێ تا داوێنی معاویە پاشەکشێی پێ کردن. ئەشتەر گەیشتە عەبدالله کوڕی بودەیل کەهاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەقوڕئان خوێنەکان نزیکەی دوسەد یا سێسەد پیاوی شەڕکەر خۆیان بەزەویەوە لکاندبو وەك بڵێی چۆکیان داباوە. ئەو شامیەکانی لەدەوروبەری ئەوان دور کردەوە و ئەوان براکانی خۆیان بینی وپرسیان: چ بەلایەك بەسەر سەروەری باوەڕداران هاتوە؟ وتیان: تەندروست و زیندوە و وەك شێر لەباڵی چەپ شەڕ دەکات و خەڵك لەدەوروبەری ئەو سەرقاڵی شەڕ کردنن. وتیان: سوپاس بۆ خوا! گومانمان دەکرد کوژراوە و ئێوە هەموتان لەناوچون. عەبدالله کوڕی بودەیل بەهاوەڵانی خۆی وت: ئێمە پێش بخەن. ئەشتەر وتی: ئەو کارە مەکە و لەگەڵ خەڵك بمێنەرەوە چونکە ئەمە باشتر پارێزگاری لەتۆ و هاورێکانت دەکات. عەبدالله رازی نەبو و بەدو شمشێر هاوشێوەی کێوێك هێرشی کردە سەر خێوەتەکەی معاویە و بینی وەك بڵێی پۆششێکیان لەئاسن وبەرد لەدەوری کۆکردۆتەوە. عەبدالله کوڕی بودەیل لەناو هاوەڵانی هاتەدەر و پێشڕەوی کرد و هەر کەس روبەروی بویەوە، کوشتی تا

دەستەیەکی فراوانی کوشتار کرد و خۆی لەمعاویە نزیك کردەوە. خەڵك لەهەر کەنارێکەوە روبەروی بونەوە و ئەویان لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی گەمارۆدا. ئەو پیاوە ئەوەندە شەڕی کرد تا خۆی و هاوەڵاتی شەرابی مەرگیان خوارد. دەستەیەك لەوان بریندار گەڕانەوە. ئەشتەر حەرەس کوڕی جومەهانی جوعفی رەوانە کرد و ئەو هێرشی کردە سەر ئەو خەڵکانە لەشام کەشوێن هاورێیانی عەبداللە کوڕی بودەیل کەوتبون. ئەوان زیانی شامیەکانیان دورخستەوە و هاوەڵانی خۆیان ئاسودە کرد و خۆیان بەئەشتەری ئەخەعی گەیاند. معاویە کوڕی بودەیلی بینیبو چەندە پیاوانە شەڕ دەکات، پرسی: ئایاسەرکردەی ئەوانە؟ کاتێك کوژرا، کەسێکی نارد تا بزانێت کێیە. خەڵکانی شام ئەویان نەناسی. معاویە خۆی ڕۆشتە سەر سەری و کاتێك بینی، ناسیەوە و وتی: عەبداللە کوڕی بودەیلە. سوێند بەخوا ئەگەر ژنانی خوزاعە فەرمانیان پێدەدرا، شەڕیان لەگەڵ ئێمە دەکرد چ بگات بەپیاوەکانیان. دواتر هۆنراوەکەی حاتەمی تایی وەك بەڵگە هێنایەوە:

اخو الحرب ان عضت الحرب عضها          و ان شمرت يوما به الحرب شمرا

یانی: پەروەردەی گۆڕەپانی شەڕ، بەشێوەیەك ئەگەر جەنگ زیانی لێ بدات، زیانی لێ دەدات و ئەگەر بۆ تلاندنی ئەو قۆڵ هەڵماڵێت، ئەویش قۆل هەڵدەکات.

ئەشتەر لەبەرابەر عەك و ئەشعەرین خۆڕاگری کرد و بەمەزحێجیەکانی وت: زیانی عەك لەئێمە دوربخەنەوە. لەناو هەمەدانیەکان وەستا وبەکەندەی وت: ئەشعەرین دوربخەنەوە. هەمویان تا ئێوارێ بەقورسی شەڕیان کرد. ئەشتەر لەگەڵ هەمەدانیەکان و دەستەیەکی دیکە لەخەڵکان شەڕیان لەخەڵکانی شام کرد و تا شوێنەکانی خۆیان پاشەکشێیان پێکردن و ئەوانیان بۆ ڕیزە پێنجیەکان دورخستەوە کەدەوری معاویەیان گرتبو و خۆیان بەدەستارەکانیان بەستبویەوە. سەرئەنجام گەیشتنە پێنجەم ریزی دەوری معاویە. معاویە داوای ئەسپەکەی خۆی کرد و سواری بو. دواتر وتی: دەمویست رابکەم کەوتاری کوڕی ئتنابەی ئەنساریم لەرۆژگاری جاهلی کەوتە بیر:

ابت لى عفتى و ابى بلائى          و اقدامى على البطل المشيح

و اعطائى على المكروه مالى          و اخذى الحمد بالصمن الربيح

و قولى كلما جشات و جاشت:          مكانك تحمدى او تستريحى

یانی: داوێن پاکی و بریقەداری من و ئەوەی بەردەوام لەگەڵ دەستە یاخیەکان ڕوبەرو دەبمەوە، ڕێگر بون لەوەی رابکەم. هەروەها بەخشینی سامانەکەم بۆ دورخستنەوە لەزیان و بەدەست هێنانی وەسف کردن بەبەهای زۆر، و وتاری من لەگەڵ ناخم (هەرجار کەبێتە جۆش وبکەوێتە خرۆش): لەسەر جێگەی خۆت بە یا لەبەر خۆڕاگری سوپاست دەکەن یاخۆت لەرەنجی ئەم ژیانە شەرمێنەرە رزگارت دەبێت.

دەڵێت: ئەم هۆنراوەیە ڕێگر بو لەبەردەم هەڵاتنم. عەمرۆ عاصیش سەیری کردم و وتی: ئەمڕۆ ڕۆژی خۆڕاگریە و بەیانی ڕۆژی شانازی. وتم: راستت وت. جوندەب کوڕی زوهەیر پێشڕەوی کرد و ڕوبەڕوی سەرکردەی ئەزدیەکانی شام بویەوە. سەرکردەی شام ئەوی کوشت. لەدەستەکەی ئەو عجەل کوڕی عەبدالله و سەعد کوڕی عەبداللەیش کوژران. ئەبو زەینەب کوڕی عەوفیش کوژرا. عەبدالله کوڕی ئەبی حوصەینی ئەزدی هاوڕێ لەگەڵ ئەو قوڕئان خوێنانەی لەگەڵ عەماری یاسر بون، بۆ شەڕ هاتەدەر و گیانی سپارد. عەقەبە کوڕی حەدیدی نومەیری هەنگاوی بردە پێش و بەردەوام دەیوت: لەوەڕگای ژیان، مشتێ خۆڵ و خاشاك، دارەکانی دڕکاوی، تازەکەی کۆنەیەك کەوتو لەسەر خاك و شیرینیەکەی تاڵە. من گیانی خۆم لەو لەوەڕگایە هەڵگرت و پشتم تێکرد. لەناو هەر سوپایەك و لەناو هەر شەڕێك ئارەزوی شەهید بونم بوە بەڵام خوا نەیویست تا ئەمڕۆ لێی بەهرەداربم. لەئێستاوە خۆمی بۆ ئامادە دەکەم و هیوادارم لێی بێبەش نەبم. ئەی بەندەکانی خوا، لەشەڕکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی بەروی خوادا شمشێریان کێشاوە، چاوەڕوانی چین؟ وتەکانی ئەو درێژەی کێشا. وتی: ئەی برادەران، من ئەم دنیام بەجیهانی بێ کۆتایی فرۆشت و هەنوکە بەرەو ئەوێ دەڕۆم. براکانی عوبەیدالله کوڕی حەدید و مالك کوڕی حەدید و عەوف کوڕی حەدید بەدوای ئەودا بەرێکەوتن و وتیان: دوای تۆ خۆشی ئەم دنیامان ناوێت. هەمویان پیاوانە شەڕیان کرد تا کوژران. شەمر کوڕی زی ئەلجەوشن هەنگاوی بردە پێش و ئەدهەم کوڕی موحرەزی باهلی شمشێری لەروخساریدا و شمریش بەهەمان شێوە، بەڵام زیانی پێ نەگەیاند. شمر بۆ خێوەتەکەی گەڕایەوە، وچونکە تینو بو، ئاوی خواردەوە و ڕمەکەی خۆی هەڵگرت و هێرشی کردە سەر ئەدهەم و دای بەزەویدا و وتی: ئەمە لەبەر ئەوە!

ئاڵای بوجەیلە لەدەستی ئەبوشەداد قەیس کوڕی هوبەیرەی ئەحمەسی ناسراو بەناوی قەیس کوڕی مەکشوحدا بو. بەخەڵکەکەی خۆی وت: سوێند بەخوا هەر ئێستا ئێوە بۆ لای خواوەندی ئەو قەڵغانە زێرینە دەبەم. مەبەستی عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید بو کەقەڵغانێکی زێرینی پێبو. بەتەواوی لەگەڵ شامیەکان شەڕی کرد وبەشمشێرێکی دەرکێشراو هێرشی کردە سەر خاوەنی قەڵغانی زێرین. یەکێك لەکۆیلەکانی معاویە ڕێگەی لێگرت و شمشێری لەقاچی ئەبوشەداد دا و قرتاندی. ئەبوشەداد ئەوی کوشت. ڕمەکان لەهەر لایەکەوەو کردیان بەنیشانە و گیانیان لێسەند. عەبدالله کوڕی قەلعی ئەحمەسی ئاڵاکەی هەڵگرت و شەڕی کرد تا لەخاك و خوێندا تلایەوە. دواتر عەفیف کوڕی ئەیاس هەڵیگرت و ئاڵاکەی لەدەستا بو تاخەڵك کەوتنە یەك. هەروەها لەم ڕۆژەدا حازم کوڕی ئەبی حازم برای قەیس کوڕی ئەبی حازم و باوکی قەیس کوژران. ئەوبە یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر هەژمار دەکرا. نوعەیم کوڕی صوهەیب کوڕی عیلەیش کوژرا. ئەوان هەمویان لەخەڵکانی بوجەیلە بون.

کاتێك عەلی بینی باڵی ڕاستی سوپاکەی گەڕاوەتە شوێنەکەی خۆی و شەڕکەران لەسەر جێگەکانی جێگر و پاشەکشێیان بەدوژمن کردوە و ڕویان کردۆتە گۆڕەپانەکانی شەڕی ئەوان و بەردەوام هێرشیان دەکەنە سەر، بەرێکەوت و ڕۆشتە لای ئەوان وتی: بینیم ئێوە لەریزیەکانی خۆتان پاشەکشێتان کرد بەشێوەیەك ئەم ستەمکارانە گەمارۆیان خستنەسەر. ئێوە سەروەری هەمو خەڵکانی ڕێزدارن کەبۆ قوڕئان خوێندن شەوانە ناخەون و بانگەوازی ڕاستی و دروستیتان بەشێوەیەکی ئاشکرا وەڵام دایەوە. ئەگەر ئێوە دوای هەڵاتن بۆ ریزەکانی شەڕنەدەگەڕانەوە و هێرشتان نەدەکرد و روبەروی دوژمن نەدەبونە، ئەوەتان بەسەردا دەسەپێنرا کەبەسەر هەڵاتوانی ڕۆژی شەڕ دەسەپێنرێت و هەموتان لەناو دەچون. بەڵام ئەوەی خەمی منی سوك کرد و کزانەوەی دڵی ئارام کردمەوە، ئەوە بوبینیم ئێوە دەرنگتر گەمارۆتان خستە سەرئەوان بەهەمان شێوە کە لەسەرەتاوە ئەوان گەمارۆیان خستە سەر ئێوە و پاشەکشێتان پێکردن بەهەمان شێوە کەپاشەکشێیان پێکردن. ئێستا ئەوان لەوشتری ڕەم کردوی تینو دەچن کەکۆتاییەکانیان سوار ئەوانەی پێشەوە دەبن. خۆڕاگری بکەنە پیشە

چونکە نارامشی خوایی بۆ سەر ئێوە داباریوە وخوا ئێوەی بەزانایی قوولّی خۆی بەهێز کردوە تا تێکشکاو بزانێت تورە خواوەندی لەناوبەری خۆیەتی. وتەکانی درێژەی کێشا. کاتێك هەردو لای شەرکەر لەصەفین شەریان دەست پێکرد، بێشر کوری عیصمەتی مێری، کەپێشتر پەیوەستی معاویە ببو، هاتە ناو گۆرەپانی شەر. بێشر سەیری مالك کوری عەقەدیەی جۆشەمی کرد وبینی پیاوانە خەرمانی ژیانی شامیەکان دروێنە دەکات. لەم کارە تورە بو وهێرشی کردە سەر مالك. ماوەیەك شەریان کرد و دواتر بێشر کوری مالك بەشمشێر لێیدا بەلاّم نەیکوشت و لێی خۆشبو و لەبەرنەوەی برینداری کردبو، پەشیمان بویەوە. پیاوێکی ستەمکار و خوێنخۆر بو. وتی:

| | |
|---|---|
| و انی لارجو من ملیکی تجاوزا | ومن صاحب الموسوم فی الصدرهاجس |
| دلفت له تحت الغبار بطعنة | علی ساعة فیها الطعان تخالس |

یانی: داوای لێخۆشبون لەخوا دەکەم چونکە لەهەلگری برین و نیشان، ئەندێشەی نازاردەر و نەشیاو بۆ سرینەوە لەدلّی مندایە. لەژێر تەپ و تۆزدا بەرم لێمدا و ئەمە لەکاتێکدا بو شمشێر و رمەکان بەخێرایی دادەباری.

وتەکانی بەگوێی بێشر کوری مالکی عەقەدمیە گەیشت و وتی:

| | |
|---|---|
| الا ابلغا بشر بن عصمة اننی | شغلت و الهانی الذین امارس |
| وصادفت منی غرة و اصبتها | کذالك و الابطال ماض و حابس |

یانی: ئەم پەیامە لەمنەوە بەگوێی بێشر کوری عصمەت بگەیێنە کەمن سەرگەرم وگرفتاری ئەو کەسانە بوم کەسەرقالّی کوشتاریانی بوم: تۆ لەیەك سات منت بەنائاگا بینی و شمشێرت دەرکێشا، پالّەوانەکان بەمشێوەن، هەندێ کات وەك شمشێر تیژن و هەندێ کات گرفتاری زیندان.

لەم بگرە و بێنەدا عەبدالله کوری توفەیلی بەکایی هێرشی کردە سەر خەلّکانی شام. کاتێك گەرایەوە، پیاوێك لەبەنی تەمیم بەناوی قەیس کوری مورە لەو کەسانەی پێشتر پەیوەستی معاویە ببو، هێرشی کردەسەر و رمی لەسەرشانەکانی دانا. کوری مامەکەی عەبدالله بەناوی یەزید کوری معاویە رێگەی لێگرت و رمەکەی خۆی خستە سەر شانی تەمیمیەکە و پێی وت: ئەگەر رمەکە بچەقێنێت، دەیچەقێنم! تەمیمی

هاواری کرد: لەگەڵ خوا پەیمان دەبەستیت ئەگەر ڕم لەسەر شانی هاوڕێکەت هەڵگرم ڕم لەسەر شانم هەڵدەگریت! وتی: بەڵێ. تەمیمی ڕمەکەی خۆی هەڵگرت و یەزیدیش ڕمەکەی خۆی. کاتێك خەڵك گەڕانەوە یەزید کوڕی معاویە لەعەبدالله کوڕی توفەیل ڕەنجا و وتی:

الم ترنی حامیت عنك مناصحا بصفين اذ خلاك كل حميم

و نهنهت عنك الحنظلي و قداتي على سابح ذی ميعة و هزيم

یانی: ئایا نەتبینی لەصەفین لەو کاتەی هەمو خزمەکانی دەوروبەرت تۆیان بەجێهێشت، من لەبەر چاکەکاری بەرگریم لەتۆ کرد؟ ڕمی حەنزەلیم لەتۆ دور کردەوە و خواوەندەکەی لەسەر سەمەندێکی تیژپێ و سۆبایی کەر لەدەریاییەکەی خرۆشاو لەخۆڵ چالاکی دەنواند و هاواری دەکرد.

پیاوێك لەبنەماڵەی عەك لەخەڵکانی شام هاتەدەر و داوای شەڕکەری کرد. قەیس کوڕی فەهدانی کەندی بۆ شەڕی ئەو ڕۆشتەدەر و پەلاماریدا. ماوەیەك شەڕیان کرد و سەرئەنجام عەبدولرەحمان ئەوی گرت و کوشتی و وتی:

لقد علمت عك بصفين اننا اذا التقت الخيلان نطعنها شزرا

و نحمل رايات الطعان بحقها فنوردها بيضا و نصدرها حمرا

یانی: خەڵکانی عەك لەصەفین بەباشی دەیانزانی کاتێك دوسوپای سوارە ڕوبەڕوی یەك ببنەوە، ئێمە لەچەپ وراستەوە لێیان دەدەین. ئاڵاکانی شەڕ، بە شێوەیەکی شیاو، هەڵدەکەین، سپیەکان دەبەینە گۆڕەپانی شەڕ و سورەکان دێنینەدەر.

قەیس کوڕی یەیزد لەهەڵاتوان بۆ لای معاویە، بۆ شەڕ هاتەدەر و ئەبو عومەری طة کوڕی یەزید ڕوبەڕوی بویەوە. یەکیان ناسیەوە و ڕێکەوتن و گەڕانەوە و هەرکامیان وتی ڕوبەڕوی براکەی خۆی بۆتەوە. خەڵکی تەی لەم ڕۆژدا ئازایانە شان بەشانی عەلی شەڕیان کرد. بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان چەندین دەستە خۆیان ئامادە کرد. حومرە کوڕی مالکی هەمەدانی هاتە لای ئەوان و وتی: ئەم خەڵکە پیرۆزە کێن؟ عەبدالله کوڕی خەلیفە کەپیاوێکی شیعی و شاعێر بو، وتی: ئێمە خەڵکانی تایی دەشت و خەڵکانی تایی ڕیگەلآن و خەڵکانی تایی کوێستانەکانی دارخورماکانین، خەڵکانی تایی ڕمەکان، تایی بەردەلآنەکان و سوارکارەکانی بەرەبەیانین. حومرە کوڕی مالك پێی وت: بەباشی

وەسفی خەڵکەکەت دەکەیت. خەڵك بەقورسی شەڕیان کرد و بەوانی وت: ئەی خەڵکانی تەی، هەر کۆنە و تازەیەك کەهەمە، قوربانی ئێوە بێت، هەوڵ بۆ دین بدەن و بۆ نەژادی لەپێشی خۆتان تێبکۆشن. بێشر کوڕی عەسوس لەم رۆژەدا هێرشی برد و شەڕی کرد تا چاوێکی خۆی لەدەستدا. لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| الاليت عينى هذه مثل هذه | و لم امش فى الحياء الا بقائد |
| و يا ليت رجلى ثم طنت بنصفها | و يا ليت كفى ثم طاحت بساعد |
| و يا ليتنى لم ابق بعد مطرف | وسعد و بعد المستنير بن خالد |
| فوارس لم تغد الحواضن مثلهم | اذا الحرب ابدت عن خدام الخرائد |

یانی: خۆزگە ئەم چاوەم وەك چاوەکەیترم کوێر دەبو وجگە لەرێبەرێك لەگەڵ خەڵکدا ڕێگەم نەدەبڕی. خۆزگە قاچم دەقرتا و خۆزگە بازوم لەدەستم جیا دەبویەوە و دوای موتەریف و سەعد و موستەنیر کوڕی مالك زیندو نەدەمامەوە. سوارکارانێك کەژنانی پەرستار هیچ کات خواردنیان بەهاوشێوەی وەك ئەوان نەداوە، پاڵەوانانی گۆڕەپانی شەڕن ئەو کاتەی شەڕ پەردە لەسەر گەوهەر و پاوانەکان هەڵبگرێت.

نەخەعیەکان( خەڵکانی ئەشتەری نەخەعی) لەم رۆژەدا باشتر و زیاتر لەهەموان شەڕیان کرد. لەناو ئەوان حەییان کوڕی هوزەبەکر کوڕی هوزە، شوعەیب کوڕی نوعەیم، رەبیعە کوڕی مالك کوڕی وەهبیل و ئوبەی کوڕی قەیس برای عەلقەمە کوڕی قەیس کوژران و قاچی عەلقەمە لەم رۆژەدا بڕا. ئەو بەردەوام دەیوت: هیچ کات نەمدەویست قاچم لەوەی هەیە باشتر بێت و ئەمە لەو شتانەیە لەبەرابەری هیوای پاداشتم لەخواوەند هەیە. دەیوت: براکەم لەخەودا بینی و پرسیم: ڕوبەڕوی چی بویتەوە؟ وتی: ئێمە لای خوای گەورە ڕوبەڕوی ئەم خەڵکە بوینەوە و ئەوانمان کردە داوەر و گفتوگۆمان کرد و بەسەریاندا سەرکەوتین. هیچ شتێك وەك ئەم خەوە شادی نەکردم. ئوبەیان بە (ئوبەی نوێژ ) ناو دەبرد چونکە نوێژی زۆری دەخوێند.

حەمیریەکان لەگەڵ دەستەکەی خۆیان هاتنەدەر و سەرکردەی ئەوان زو ئەلکەلاع بو و عوبەیدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب هاورێیەتی دەکرد. ئاهەنگی خەڵکی رەبیعەیان کرد کە لەباڵی چەپی سوپای عێراقیەکان جێگیر بون و فەرماندەکەیان عەبداللە کوڕی عەباس بو. حەمیریەکان بەقورسی هێرشیان کردە سەر خەڵکانی

ڕەبیعە تا ئەو ڕادەی ئاڵای ڕەبیعە لەشوێنەکەی خۆیدا نەما. ئاڵاکەیان لەدەستی ئەبوساسان حوزەین کوڕی مونزەر بو. خەڵکانی شام دەستبەرداریان بون. دواتر دوبارە عوبەیدالله کوڕی عومەر هێرش برد و وتی: ئەی خەڵکانی شام، ئەم تیرە لەعێراقیەکان بکوژەکانی عوسمان و هاوڕێیانی عەلین. بەقورسی هێرشیان کردە سەر خەڵکانی ڕەبیعە وئەوان بەرگریان کرد و بەشێوەیەکی هەرچی باشتر و زیاتر خۆڕاگریان کرد جگە لەدەستەیەکی کەم لە لاوازەکان و ئەوانەی باوەڕیان لاواز بو و پاشەکشێیان کرد. ئاڵاهەڵگرەکان و خۆڕاگرەکان و قورئان خوێنەکان خۆڕاگریان کرد و ئازایانە شەڕیان کرد. خالید کوڕی مەعمەر لەگەڵ هەڵاتوان رایکرد و ئەو سەرکردەی ڕەبیعە بو. کاتێك بینی ئاڵادارەکان خۆڕاگری دەکەن، گەڕایەوە و بانگی هەڵاتوانی کرد تا بگەڕێنەوە و ئەوان گەڕانەوە. سەبارەت بەخالید بەعەلیان وتبو لەگەڵ معاویە نامە بۆ یەکتر دەنێرن. عەلی بانگی کرد و خەڵکی ڕەبیعە لەگەڵی هاتن. عەلی لەمبارەوە پرسیاری لێکرد و وتی: ئەگەر کارێکی لەو چەشنەت کردوە، بۆ هەر شارێك دەتەوێت بڕۆ چونکە معاویە هیچ فەرمانێ بەسەرتۆدا نیە. خالید وتی: ئەم هەواڵە ڕاست نیە.

خەڵکی ڕەبیعە وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر بزانین ئەم کارەی کردوە، دەیکوژین. عەلی پەیمانی بەهێزی لێوەرگرتن و ئازادی کرد. لەوساتەی هەڵات، هەندێ لەخەڵکان ئەم تۆمەتەیان بۆ هەڵبەست و بەم شێوەیە داوای لێخۆشبونی کرد: کاتێك بینیم دەستەیەك لەخەڵکانی خۆم هەڵاتن، لەپێشەوە ڕێگەم لێگرتن تا بیانگەڕێنمەوە و بەم پێیە، هاورێ لەگەڵ ئەو کەسانەی فەرمانیان لێبردم، گەڕامەوە. کاتێك خالید کوڕی مەعمەر گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، خەڵکی ڕەبیعەی بۆ شەڕ هاندا و شەڕی ئەوان لەگەڵ حەمیریەکان و عوبەیدالله کوڕی عومەر روی لەسەختی و دژواری کرد وکوژارەکان لەناو هەردولا روی لەزیاد بون کرد. سومەیر کوڕی ریان عێجلی کەپیاوێکی بەهێز و ماندونەناس بو، لەم شەڕەدا کوژرا. زیاد کوڕی حەصفە هاتە لای خەڵکی عەبدقەیس و ئەوانی ئاگادار کردەوە کەخەڵکی بەکر کوڕی وایل لەدەست حەمیریەکان چ بەڵایەکیان بەسەردا هاتوە. وتی: ئەی خەڵکی عەبدقەیس، دوای ئەمە خەڵکانێك بەناوی بەکر کوڕی وایل لەناو ئێوەدا نابن. لەبەر ئەمە خەڵکی عەبدقەیس بۆ هاوکاری بەکر کوڕی وایل ڕۆیشتن و هاورێ لەگەڵ ئەوان شەڕیان کرد. لەم شەڕەدا

بو زوئەلکەلاعی حەمیری و عوبەیداللە کوڕی عومەر کوژران. عوبەیداللە بەدەستی موحرەز کوڕی صەحصەح لەخەڵکانی تەیم الله کوڕی سەعلەبە لەخەڵکی بەسرە کوژرا. کاتێك معاویە بوبەپاشای عێراق، تۆڵەی کردەوە. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو هانی کوڕی خەتابی ئەرحەبی یا مالك کوڕی عومەر تەنعی حەزرەمی ئەوی کوشت.

عەمار کوڕی یاسر لەناو خەڵك بۆ شەڕ هاتەدر و وتی: ئەی خوایە، تۆ دەزانی ئەگەر بزانم رەزامەندی تۆ لەوەدایە خۆم فرێدەمە ناو دەریا، ئەو کارە دەکەم. ئەی خوایە ، تۆ دەزانی ئەگەر بزانم رەزامەندی تۆ لەوەدایە، نوکی شمشێر بخەمەسەر سکم و بەسەریدا بچەمێمەوە تا لەپشتمەوە بێتەدەر، ئەو کارە دەکەم. بەڵام ئەمڕۆ کارێکی تر بۆ رەزامەند کردنی تۆ جگە لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەم ستەمکارە وەحشیانە ناناسم. ئەگەر کارێکی دیکە شك ببەم زیاتر تۆ رەزامەند دەکات، ئەنجامم دەدا. من کەسانێك دەبینم بەسەختی لەنێوە دەدەن و گومڕاکان و لادەرەکان ئەو گومانەیان لا دروست دەبێت، بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر لێمان بدەن ( و سەدان فەرسەخ پاشەکشێمان پێبکەن) تا بگەینە دارخورماکانی هەجەر، بێ گومان لەسەر ئەو باوەڕە دەبم ئێمە لەسەر راستی و دورستین و ئەوان لەسەر ناراستی و نادروستی. دواتر هاواری کرد: چ کەسێك بەدوای رەزامەندی خواوەند دەگەڕێت و نایەوێت بۆ لای سامان و ماڵ و منداڵەکەی بگەڕێتەوە؟ دەستەیەك لەو نزیك کەوتنەوە. وتی: ئێمە بۆ لای ئەو کەسانە ببەن کەداوای خوێنی عوسمان دەکەن. سوێند بەخوا ئەوان خوازیاری خوێنی ئەو نین بەڵکو ئەوان تامی خۆشیەکانی ئەم دنیایان کردوە و دڵیان پێداوە و دەزانن ئەگەر راستی و دروستی یەخەی ئەوان بگرێت، لەنێوان ئەوان و بەختەوەریەکانیان جیایی دروست دەکات و رێگە نادات لەناو سامانی خەڵك و خۆشیەکانی خۆیان بتلێنەوە. ئەوان پێشینەیەکیان نیە تا بۆ فەرمان و فەرمانڕەوایی کردن شیاو بن. لەبەر ئەمە خۆیان فریودا و وتیان: رێبەری ئێمەیان بەستەم کوشت. ئەمەیان کردە بیانو تا لەم رێگاوە بەمەبەستەکانی خۆیان بگەن و ببنە پاشایەکی خاوەن دەسەڵات و دیکتاتۆر. ئەمە بارودۆخیانە کەدەیبینن. ئەگەر ئەمە فریوکاری نەدەبو، تەنانەت دوان لەخەڵك شوێنیان نەدەکەوتن. ئەی خوایە ئەگەر سەرکەوتن بەئێمە ببەخشیت و رۆژگارێکی

درێژە ئەو کارە دەکەیت و ئەگەر ئەم شەڕە لەبەرژەوەندی ئەوان کۆتایی پێدێنیت، بۆ ئەوان لەسزای ئەو بەڵایانەی بەسەر بەندەکانی تۆدا هێنایان، ئەشکەنجەیەکی بەئازار دیاری بکە. دواتر لەگەڵ ئەو دەستەیە بەرێکەوت. لەهیچ دۆڵێك لەدۆڵەکانی صەفین تێپەڕی نەکرد مەگەر ئەوەی پاشماوەکان لەهاوەڵانی پێغەمبەر لەگەڵیدا بەرێدەکەوتن. دواتر ڕۆشتە لای هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی وەقاص ناسراو بەناوی (مێرقاڵ) ئاڵاداری عەلی کەپیاوێکی یەك چاو بو. پێی وت: ئەی هاشم، ئایا یەك چاوی و ترسەنۆکی؟ ئەو یەك چاوەی خۆی ئاخاتە گۆڕەپانی شەڕەوە، سودی نیە. هاشم لەگەڵ ئەو بەرێکەوت و وتی:

اعور يبغي اهله محلا قد عالج الحياةوحتى ملا

لابدان يفل او يفلا يتلهم بذى الكعوب تلا

یانی: من ئەو یەك چاوەم بۆ بنەماڵەکەی خۆی بەدوای پێگەیەکدا دەگەڕێت، ئەوەندە ژیانی چەشتوە کەبێزار بوە. دەبێت بەناچاری شکەست بدات یا شکەست بدرێت. ئەوانی بەڕمە گیان ستێنەکان دەخستە سەر زەوی.

عەمار بەردەوام دەیوت: ئەی هاشم، بۆ پێشەوە بڕۆ، چونکە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکان و مەرگ لەکەناری ڕمە بڵندەکانە. دەرگاکانی ئاسمان کراوەیە و کچە جوانە چاو گەورە بەهەشتیەکان خۆیان ڕازاندۆتەوە. ئەمڕۆ دەرۆمە دیداری هاوەڵانی خۆم و پیاڵە لەدەست گیانان دەستێنم: هیوادارم محەممەد و هاوەڵانی لەئامێز بگرم؟ ئەو بۆ پێشەوە ڕۆشت تا گەشتە عەمرۆ عاص و وتی: ئەی عەمرۆ، دینەکەت بەفەرمانڕەوایی میسر فرۆشت، قوڕ بەسەرت! عەمرۆ وتی: بەمشێوە نیە بەڵکو من داوای خوێنی عوسمان دەکەم. عەمار وتی: من لەسەر بنەمایی ناسینی تۆ، شایەتی دەدەم هیچ کارێکت بەمەبەستی خوایی نەکردوە، ئەگەر ئەمڕۆ نەکوژرێیت بەیانی دەمریت، بڕوانە بزانە چۆن خەڵك لەسەر بنەمایی ئەندێشە دەرونیەکانیان سزا و پاداشت دەدەن، ئەندێشی ئاخی تۆ چیە. تۆ لەگەڵ خواوەندی ئەم ئاڵایە کەشان بەشانی پێغەمبەر شەڕی دەکرد، سێ جار شەڕت کردوە، ئەم چوارەمین جارە و باشتر و خۆپارێزانەتر نیە. دواتر عەمار دەستی بەشەڕ کرد و نەگەڕایەوە تا کوژرا.

حەبە کوڕی جوەینی عورەنی دەڵێت: بەحوزەیفە کوڕی یەمانم وت: بۆ ئێمە

لەپێغەمبەر شتێك بڵێ چونكە لەئاژاوەكان دەترسین. حوزەیفە وتی: ئەركی سەرشانی ئێوە بێت هاورێ لەگەڵ دەستەیەك كەكوڕی سومەیە لەناویاندا بێت، چونكە لەپێغەمبەرم بیست دەیوت: ئەو بەدەستی سوپایەكی بێدادگەر و ستەمكار دەكوژرێت. دوایین ڕۆژی ئەو (شیراو) دەبێت كەشیری تێكەڵ بەئاوە. حەبە كوڕی جومین دەڵێت: ڕۆژێك كەتیایدا كوژرا، بینیم دەیوت: دوایین ڕۆژی من لەم جیهانە بێنن. بۆ ئەو شیراوییكیان لەكاسەیەكی گەورەدا هێنا كەبازنەیەكی سوری پێوەبو. حوزیفە لەوەی وتبوی: بەئەندازەی تاڵە موێك هەڵەی نەكردبو. عەمار لەو كاتەدا وتی: ئەمڕۆ چاوم بەهاوڕێیان، محەممەد و هاوەڵانی، كەوت. سوێند بەخوا ئەگەر تا دارخورماكانی هەجەر پاشەكشێمان پێبكەن، دوبارە بێ گومان دەزانم ئێمە لەسەر ڕاستی و دروستین. ئەبو غازیە ئەوی كوشت و كوڕی حەوی سەكسەكی سەری لەجەستەی جیا كردوە. دەستەیەك دەڵێن: یەكێكی دیگە ئەوی كوشت.

زونەلكەلاع لەعەمرۆ عاصی بیستبو كەدەڵێت: پێغەمبەر بەعەمار كوڕی یاسری وت: تۆ بەدەستی دەستەیەكی ستەمكار دەكوژرێیت و دوایین خواردنەوەیەك كەدەیخۆت، كەمێك شیراوە. زونەلكەلاع بەردەوام بەعەمرۆ عاصی دەوت: ئەی عەمرۆ، هاوار لەتۆ، ئەمە چ كارێكە گرفتاربوین پێی؟ عەمرۆ وەڵامی دەدایەوە: ئەو بۆ لای ئێمە دەگەڕێتەوە. زونەلكەلاع پێش عەمار لەناو سوپای معاویەدا كوژرا و عەمار دوای ئەو لەناو لەشكری عەلی گیانی ئەسپەردە كرد. عەمرۆ عاص بەمعاویەی دەوت: نازانم لەكوژرانی كامیان شادمان بم زونەلكەلاع یا عەمار. سوێند بەخوا ئەگەر زونەلكەلاع دوای عەمار زیندو دەما، هەمو خەڵكانی شامی پەیوەستی سوپاكەی عەلی دەكرد. دوای ئەوە كەسانی زۆر هاتنە لای معاویە و وتیان: من ئەوم كوشت. عەمرۆ پرسی: لەدوایین سات چی وت؟ ئەوان قسەی هەڵیت و پڵیتیان دەوت. كوڕی حەوی سەكسەكی هات و وتی: من ئەوم كوشت و بیستم دەیوت: ئەمڕۆ چاوم بەهاوڕێیان، محەممەد و یارانی دەكەوێت. عەمرۆ وتی: بكوژەكەی تۆیت. دواتر وتی: لەجێگەكەی خۆت بەا دودەستی تۆ هیچ كارێكیان نەكرد بەڵكو تۆ بویتە هۆكاری توڕەبونی خواوەند.

دەستەیەك دەڵێن: ئەبولغازیە كەعەماری كوشت تا ڕۆژگاری حەجاج كوڕی یوسفی سەقەفی بەزیندویی مایەوە. ئەوو ڕۆژێك هاتە لای حەجاج. حەجاج ڕێزی لێگرت و

پرسی: تۆ کوڕی سومەییت کوشت؟ وتی: بەڵێ. حەجاج وتی: هەر کەس بیەوێت سەیری پیاوێکی ڕێزدار لەرۆژی هەستانەوە بکات دەبێت سەیری ئەم پیاوە بکات کەکوڕی سومەییەی کوشتوە. لەم کاتەدا ئەبوئەلغازیە داوای هاوکاری لەحەجاج کرد. حەجاج نیازەکەی بەراوەردە نەکرد. ئەبوئەلغازیە وتی: جیهانمان بۆ ئەوان تەخت کرد و دواتر یەك درەم بەئێمە نادەن و گومان دەکەن لەرۆژی هەستانەوە ڕێزدارین! حەجاج وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا هەرکەس (وەك عەماری یاسر) دانەکانی وەك کێوی ئۆحوّد و ڕانی وەك (وەرقان) و کۆڕەکانی وەك مەدینە و ڕەبزە بێت، لەرۆژی هەستانەوە زۆر ڕێزدار بەرچاو دەکەوێت! سوێند بەخوا ئەگەر هەمو خەڵکی زەوی لەخوێنی عەماردا شەریك بن، هەموبان بەرەو دۆزەخ دەڕۆن.

عەبدولرەحمان کوڕی سولەمی دەڵێت: کاتێك عەمار کوژرا، ڕۆشتمە ناو سوپاکەی معاویە تا بزانم ئایا کوژرانی عەمار ئەو هەراوهوریاییەی لەناو سوپاکەی ئەواندا دروست کردوە وەك چۆن لەسوپاکەی ئێمە دروستی کردوە. بەسەرهاتی ئێمە لەگەڵ سوپای معاویە بەمشێوەبو هەرکاتێك ئاگری جەنگ دادەمرکایەوە، ئەوان لەگەڵ ئێمە گفتوگۆیان دەکرد و ئێمە لەگەڵ ئەوان. بینیم معاویە، عەمرۆ عاص، ئەبوالاعوەر و عەبداللە کوڕی عەمرۆ سەرقاڵی گفتوگۆن. ئەسپەکەی خۆم بۆ لای ئەوان غاردا تا وتارەکەیان لەدەست نەدەم. عەبداللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاص بەباوکی خۆی وت: باوەگیان، ئەم پیاوەتان لەم رۆژەدا کوشت و دەزانن پێغەمبەر سەبارەت بەو چی وتوە. وتی چی وتوە؟ وتی: ئایا بەو شێوە نەبو کاتێك مزگەوتی پێغەمبەر دروست دەکرا، خەڵك هەمو جارێك خشتێکیان هەڵدەگرت و عەمار دوانی هەڵدەگرت و ئەوەندە هەوڵیدا تا لەهۆش خۆی چو. پێغەمبەر ڕۆشتە سەر سەری و تەپ و تۆزی لەروخساری دەسڕی و دەیوت: ئەی کوڕی سومەییە، هاوار لەتۆاکەسانی دیکە یەك خشت هەڵدەگرن و تۆ هەرجارەو و دوخشت هەڵدەگری، لەگەڵ ئەمەیشدا سوپای ستەمکار تۆ دەکوژێت. عەمرۆ عاص بەمعاویەی وت: دەبینی کوڕەکەم چی دەڵێت؟ معاویە وتی: چی دەڵێت؟ عەمرۆ بۆی باس کرد. معاویە وتی: ئایا ئێمە ئەومان کوشت؟ کەسێك ئەوی دابەکوشت کەهێنای بۆ گۆڕەپانی شەڕ. خەڵکانی شام لەخێوەتەکانی خۆیان هاتنەدەر و بەردەوام دەیانوت: عەمار یاسر کەسێك بەکوشتی دا کەهێنای بۆ گۆڕەپانی شەڕ.

نەمزانی کامیان سەرسوڕهێنەرترن، ئەو، یا ئەوان.

کاتێك عەمار کوژرا، عەلی بەخەڵکانی هەمەدان و ڕەبیعەی وت: ئێوە زرێ ورمی منن. لەم کاتەدا دوانزە گورزی بەهێز خوازیار بون. عەلی سوار لەسەر ئێسترێك وەك فەرماندەی ئەوان بۆ پێشەوە ڕۆیشت. ئەوان هاوشێوەی یەك پیاو هێرشیان کرد و هەمو ریزەکانی سوپای معاویەیان لێك هەڵۆوشاند. بەهەر کەس گەیشتن، کوشتیان تا گەیشتنە معاویە و عەلی بەردەوام دەیوت:

اقتلهم و لا اری معاویه          الجاحظ العین العظیم الحاویه

یانی: ئەوان کوشتار دەکەم بەڵام معاویە نابینم ئەو پیاوە چاو دەرتۆقیوە ورگ زلە.

دواتر معاویەی بانگی کرد و وتی: بۆ دەبێت خەڵك لەناو ئێمەدا بکوژرێن؟ باخوا بکەینە داوەر و هەر کەس لەناو ئێمەدا بکوژرێت، ئەویتر ببێتە فەرمانڕەوا. عەمرۆ عاص وتی: معاویە داوای داد دەکات. معاویە وتی: بەڵام تۆ دادپەروەریت نەکرد، دەزانی هەر کەس بڕواتە شەڕی ئەو، دەکوژرێت. عەمرۆ وتی: شیاو نیە لەشەڕی ئەو خۆت دور بخەیتەوە. معاویە پێی وت: دەتەوێت دوای من بێیتە سەر کار! هاورێیانی عەلی دو کەسیان دانا بو تا ڕێگە نەدەن عەلی شەڕ بکات. هەرجار ئەوان لێی بێ ئاگا دەبون، عەلی هێرشی دەبرد و نەدەگەڕایەوە مەگەر ئەوەی خوێن لەشمشێرەکەی دەتکا. شمشێرەکەی خۆی بۆ لای ئەوان فرێدەدا و دەیوت: ئەگەر خوار نەدەبو، نەدەگەڕامەوە. ئەعمەش بە باوکی عەبدولرەحمانی وت: سوێند بەخوا ئەمە شمشێر وەشاندنێکی بوێراندیە. باوکی عەبدولرەحمان وتی: ئەو خەڵکەی شتێکیان بیست و بەهاکەیان دا، درۆزن نەبون.

معاویە دەستەیەك لەهاوەڵانی عەلی بەئەسیری گرت. عەمرۆعاص وتی: بیانکوژە. عەمرۆ کوڕی ئەوس لەخەڵکی (ئەود) وتی: من دەکوژیت لەکاتێکدا خاڵی منیت. معاویە وتی: لەنێوان ئێمە و خەڵکی ئەود هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی نەبەستراوە، چۆن من خاڵی تۆم؟ عەمرۆ وتی: ئەگەر پێت بڵێم ئەمانم دەدەیت؟ معاویە وتی: بەڵێ. عەمرۆ وتی: مەگەر خوشکەکەت دایکی حەبیبە ژنی پێغەمبەر نەبو؟ معاویە وتی: بەڵێ. عەمرۆ وتی: من کوڕی ئەوم و تۆ برای ئەو و خاڵی منیت (قوڕئان: ژنانی پێغەمبەر دایکی ئێوەن (ئەحزاب/٦/٣٣). معاویە وتی: سڵاوی خوا لەباوکی! ئایا لەناو

ئەمانە کەس جگە لەو هەستی بەمە نەکرد؟ معاویە ئازادی کرد. عەلیش دەستەیەکی بەئەسیری گرتبو بەڵام ماوەیەك دواتر ئەوانی ئازاد کرد و ئەوان گەڕانەوە بۆ لای معاویە. معاویە ئەسیری فراوانی لەبەر دەستابو و عەمرۆ عاص بەردەوام دەیوت: ئەوان بکوژە. کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر هاتنە لای معاویە، وتی: ئەی عەمرۆ، ئەگەر فەرمانی تۆمان سەبارەت بەئەسیرەکان بەکار دەبرد، گرفتاری کارێکی قێزەون دەبوین. ئەو ئەسیرەکانی ئازاد کرد.

بەڵام هاشم کوڕی عەتەبە، ئەو لەکاتی ئێوارێ خەڵکی کۆکردەوە و وتی: هەر کەسێك خواوەند و جیهانی کۆتایی دەوێت، بەرەو لای من بێت! دەستەیەکی فراوان دەوریان گرت. ئەو چەندین جار هێرشی کردە سەر شامیەکان و خەڵکانی شام خۆڕاگریان کرد. بەو پەڕی هێزەوە شەڕی دەکرد و بەهاورێکانی خۆی دەوت: خۆڕاگری ئەوان ئێوە نەترسێنێت چونکە جگە لەدەستەیەك بیابان نشینی کەڕ و کوێر و گومڕا کەس لەژێر ئالاکەی ئەواندا نیە، ئەوان لەسەر خراپە و خراپەکارین وئێوە لەسەر راستی و دروستی. دواتر هاوەڵانی خۆی هاندا و هاورێ لەگەڵ قورئان خوێنەکان هێرشی کرد. ئەوان سەرقاڵ بون کەگەنجێکی تازە پێگەیشتو هاتەدەر و وتی:

| | |
|---|---|
| انا ابن ارباب الملوك غسان | و الجائن اليوم بدين عثمان |
| نبانا قرائنا بما كان | ان عليا قتل ابن عفان |

یانی: من کوڕی شای شاکان غەسانم، ئەمڕۆ لەسەر دینی عوسمان دەژیم قورئان خوێنەکانمان وتیان چی رویداوە، عەلی، کوڕی عەففانی کوشتوە.

ئەو هێرشی دەست پێکرد و بەردەوام جوێنی دەدا، دواتر دەگەڕایەوە. هاشم پێی وت: ئەی کوڕی گەنج، ئەم وتەیە شەڕی بەدواوەیە و دوای ئەم شەڕە لێپرسینەوەیەك لەئارادایە. لەخوا بترسە ئەو کاتەی سەبارەت بەجێگە و مەبەستت لەم قسانە لێکۆڵینەوە دەکات. گەنج وتی: شەڕ لەگەڵ ئێوە دەکەم چونکە سەروەری ئێوە نوێژ ناخوێنێت و ئێوەیش بەهەمان شێوە. سەروەری ئێوە خەلیفەی ئێمەی کوشت و ئێوەیش هاوکاریتان کرد. هاشم وتی: تۆ چ کارێکت بەعوسمان هەیە! ئەو بەدەستی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا و کوڕی هاوەڵانی پێغەمبەر و قورئان خوێنەکان کوژرا. ئەوان پیاوانی زانست و دین بون. کاری ئەم دینە بۆ چاو تروکانێکیش پشت گوێ

نەخرا. بەلآم ئەوەی وتت: سەرومری نێوە نوێژ ناخوێنێت، ئەو یەکەم کەس بو نوێژی خوێند، ئەو شارەزاترینی خەلکان لەپرسیارە دینیەکانە و لەهەموان بۆ پێغەمبەری خوا شیاوترە. هەمو ئەو کەسانەی لەگەڵ من دەیانبینیت، خوێنەرانی هەمیشەییی نوسراوی خوان و شەو تابەیانی بەئاگا دەمیننەوە و بەنوێژ و پاڕانەوە سەرقاڵ دەبن. با ئەم چارەڕەشانە تۆ گومڕا نەکەن. گەنج وتی: ئایا ڕێگەیەك بۆ گەڕانەوەی من هەیە؟ هاشم وتی: بەڵێ، بۆ لای خوا بگەڕێرەوە تا لێت خۆش بێت چونکە لەبەندەکانی خۆی خۆش دەبێت و لەخراپەکان چاودەپۆشێت. گەنج دەستی لەشەڕ کردن هەلگرت. خەلکانی شام پێیان وت: پیاوی عێراقی تۆی فریودا. گەنج وتی: هەرگیز، بەلکو باشەی منی ویست و بەئاگای هێنامەوە. هاشم و هاورێکانی شەڕیان کرد تا سەرکەوتنیان بەچاوی خۆیان بینی. لەکاتی ئێوارێ سوپایەك لەتەنوخ روبەرویان بویەوە. هاشم بۆ شەڕ ریزی بەست و وتی:

| | |
|---|---|
| اعور يبغی اهله محلا | لابد ان يفل او يفلا |
| قد عالج الحياة حتی ملا | يتلهم بذی الكعوب تلا |

یانی: من ئەو یەك چاوەم بۆ بنەماڵەکەی خۆی بەدوایی پێگەیەکدا دەگەڕێت، تامی ژیانی کردوە و بێزارە لێی. دەبێت بەناچار یا شکەست بدات یا شکەست بخوات. ئەوانی بەڕمە گیان ستێنەکان لەخاك و خوێندا دەگەوزاند.

لەم رۆژەدا نۆ یا دەکەس کوژران. حەرەس کوڕی مونزەری تەنوخی هێرشی کردە سەر و بەڕم لێدا و خستیە سەر زەوی. عەلی پەیامی بۆ نارد کەنالآکەت بۆ پێشەوە ببە. ئەو بەنێردراوی عەلی وت: سەیری سکم بکە هەلدڕاوە. حەجاج کوڕی غەزیەی ئەنساری وتی:

| | |
|---|---|
| فان تفخروا بابن البديل و هاشم | فنحن قتلنا ذا الكلاع و حوشبا |
| و نحن تركنا عند معترك القنا | اخاك عبيدالله لحما ملحبا |
| و نحن احطنا بالبعير | و نحن سقيناكم سماما مقشبا |

یانی: ئەگەر شانازی بەکوشتنی کوڕی بودەیل و هاشمی عەتەبە دەکەن، ئێمە لەئێوە زوئەلکەلاع و حوشەبمان کوشت و لەشوێنی بەریەك کەوتنی ڕمەکان، براکەت عەبداللەمان وەك گۆشتێکی کوتراو بەجێهێشت. وشتر و کەسانی ئەومان گرت و

لەشمشێرێکی تیژ و نەرم و سوك و درەوشاوە، شەربەتی مەرگمان دەرخوارددان.

عەلی لای سوپایەکی خەڵکی شام تێپەڕی کرد وبینی لەشوێنەکەی خۆیان ناجوڵێن، ئەوان لەغەسانیەکان بون. وتی: ئەوان لەشوێنەکانی خۆیان ناجوڵێن مەگەر بەلێدانی شمشێر و ڕم کەسەرەکان بپەڕێنێت، ئێسقانەکان بشکێنێت و دەست و پەنجەکان بقرتێنێت. لەشوێنی خۆیان ناجوڵێن تا ناوچاوانیان بەگورزە ئاسنینەکان بکوترێت. لەکوێن خواوەندانی هاوکاری و خۆڕاگری و خوازیارانی پاداشتی خوایی؟ سوپایەك لەموسوڵمانان لەدوری کۆبونەوە. محەممەدی کوڕی بانگ کرد و پێی وت: ئارام بەرەو ئەم ئاڵایە هەنگاو هەڵبگرە و کاتێك سەری ڕمەکان لەسینەیان چەقی دەست لەشەڕ هەڵگرە تا فەرمانی من بەتۆ بگات. ئەو کارەی کرد و عەلی دەستەیەك شەڕکەری بۆ ئامادە کرد و لەگەڵ ئەودا رەوانەی کرد و فەرمانی شەڕکردن لەگەڵ شامیەکانی پێدا. ئەوان هێرشیان برد و شامیەکان لەشوێنەکانی خۆیان پاشەکشێیان کرد و چەندین کەس لەوانیان کوشت. لەم ناوەدا ئەسوەد کوڕی قەیسی موڕادی لای عەبدالله کوڕی کەعبی موڕادی تێپەڕی کرد کە لەسەر زەوی کەوتبو. عەبدالله بانگی کرد: ئەی ئەسوەد! وتی: گیانە. ئەوی ناسیەوە و وتی: سوێند بەخوا کوژرانی تۆ بۆ من دژوارە. ڕۆشتە سەر سەری و پێی وت: ئەوکەسەی پەنا بۆ تۆ ببات، لەزیان رزگاری دەبێت. تۆ ئەو کەسەی بویت بەردەوام لەبیری خوادا بویت. خوا لێت خۆش بێت، ئامۆژگاریم بکە. وتی: پێشنیاریت پێدەکەم بەردەوام کەسێکی خۆپارێز بیت و بەردەوام چاکەخوازی عەلی کوڕی ئەبی تالب و شان بەشانی ئەو لەگەڵ پێشێلکەرانی دینی خوا شەڕ بکەیت تا سەرکەوتن بەدەست دێنیت یا پەیوەستی خوا دەبیت. لەمنەوە سلاوی بگەیێنە و بڵێ: لەم گۆڕەپانەدا ئەوەندە تێبکۆشە تا لەپشت سەرت بەجێی بێڵیت چونکە هەرکەس ئەم شەو بکاتە بەیانی و گۆڕەپانی شەڕی لەپشت سەر بەجێ هێشتبێت، لەدوژمن لەپێشترە. دوای ماوەیەکی کورت گیانیدا. ئەسوەد ڕۆشتە لای عەلی و ئاگاداری کردەوە. عەلی فەرموی: خوا لێی خۆش بێت چونکە لەژیانی شەڕی لەگەڵ دوژمنەکەمان کرد ولەکاتی مردن ئامۆژگاری کردین.

دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی ئەم ئامۆژگاریەی بەعەلی کوڕی ئەبی تالبدا، عەبدولرەحمان کوڕی حەنبەلی جومەحی بو. دەڵێت: خەڵك ئەو شەوە تا بەیانی

شەڕیان کرد و ئەمە شەوی (قروسکە)بو (شامیەکان لەترسی تیغی عەلی و مالکی ئەشتەر تابەیانی دەیانقروسکاند). ئەوەندەیان ڕم لەیەکدا تا ڕمەکان شکان و ئەوەندە تیربارانی یەکتریان کرد تا تیرەکان کۆتایی پێهاتن. دواتر دەستیان بۆ شمشێرەکان برد. عەلی لەنێوان باڵی ڕاست و چەپ هاتوچۆی دەکرد و فەرمانی بەدەستە شەڕکەرەکان دەدا هێرش بکەنە سەر سوپای بەرابەریان. ئەوەندە لەسەر ئەم کارە بەردەوام بو تا شەوی کردە بەیانی و سەراسەری گۆڕەپانی شەڕ لەپشت سەریەوە بو. ئەشتەر لەباڵی ڕاست جێگیربو، کوڕی عەباس لەباڵی چەپ و عەلی لەناو دڵی سوپا. خەڵك لەهەر لایەکەوە شەڕیان دەکرد. ئەمە لەڕۆژی هەینیدا رویدا. ئەشتەر لەگەڵ باڵی ڕاست بۆ پێشەوە غاریدەدا و هێرشی دەبرد. لەشەوی پێنج شەممە و شەوی هەینی سەرکردایەتی باڵی ڕاستی گرتە دەست. ڕۆژی هەینی تا هەڵاتنی خۆر و گەیشتنی کاتی نیمەڕۆ شەڕی کرد. بەهاوەڵانی خۆی دەوت: بەئەندازەی ئەم ڕمە بۆ پێشەوە بڕۆن. ئەوانی بۆ پێشڕەوی هاندەدا و کاتێك ئەم کارەیان دەکرد، دەیوت: بەئەندازەی ئەم کەوانە بڕۆنە پێش و کاتێك ئەم کارەیان دەکرد تکای لەوان دەکرد بەردەوام بن تا ئەوەی زۆربەی خەڵك لەپێشڕەوی بێزار بون. کاتێك ئەشتەر ئەمەی بینی، وتی: بەخوا پەناتان دەدەم تا کۆتایی ئەمڕۆ لەشیری مەڕ نۆش بکەن! دواتر سوار ئەسپەکەی خۆی بو و ئاڵاکەی خۆی لەدەستی حەییان کوڕی هوزەی ئەخەعی بەجێهێشت و خۆی لەناو دەستە شەڕکەرەکان دەگەڕا و دەیوت: کێیە گیانی خۆی لەڕێگای خوادا بفرۆشێت و هاورێ لەگەڵ ئەشتەر شەڕ بکات تا سەرکەوتن بەدەست بێنێت یا بۆ لای خوا بگەڕێتەوە؟ دەستەیەکی فراوان و لەناو ئەوان حەییان کوڕی هوزەی ئەخەعی لەدەوری کۆبونەوە. ئەو لەشوێنەکەی خۆی گەڕایەوە و بەوانی وت: فیدایی ئێوەبن خاڵ و مامەکانی من! و دواتر دابەزی و دەستی لەناوچاوی ئەسپەکەی دا و بەئاڵادارەکەی وت: ئاڵاکە بۆ پێشەوە ببە. هێرشی کردە سەر شامیەکان و ئەوان هێرشیان کردە سەر شامیەکان. بەرادەیەك کوشتاری لەشامیەکان کرد کە تا لەشکەرگەکەیان پاشەکشێی پێکردن. لەناو لەشکرگەکەی خۆیان ئازایانە خۆڕاگری و شەڕیان کرد. ئاڵادارەکەی ئەشتەر کوژرا. کاتێك عەلی بینی لەشوێنەی ئەشتەرەوە سەرکەوتن دەرکەوتوە، خەڵکانی خۆی بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد. عەمرۆ عاص

بەکۆیلەکەی خۆی وەردانی وت: ئایا دەزانی داستانی من و ئەشتەر لەگەڵ تۆ چۆنە؟ وتی: نازانم. وتی: وەك ئەمە (ئەشقەرە، وشتری رەنگ سوری زەردباو) وایە ئەگەر بۆ پێشەوە بڕوات، دەکوژرێت و ئەگەر بۆ دواوە بڕوات دەکوژرێت. ئەگەر پاشەکشێ بکەیت، دەتکوژم. کۆیلەی داماو وتی: ئەی باوکی عەبداللە، سوێند بەخوا، تۆ بۆ زۆنکاوەکانی مەرگ دەبەم، دەستت بخەرە سەرشانم. ئەو بۆ پێشەوە دەڕۆشت و عەمرۆ عاص بەدوایدا. کۆیلەی وتی: بێ گومان تۆ بۆ زۆنکاوەکانی مەرگ دەبەم. شەڕ بەردەوام روی لەقورس بون دەکرد.

## هەڵکردنی قورئانەکان

## بانگەواز بۆ داوەری

کاتێك عەمرۆ عاص لەناوچونی خۆی بەچاو بینی و بینی شەڕی عێراقیەکان دژوار بوە، بەمعاویەی وت: ئایا دەتەوێت بۆ کارێك رێنوێنیت بکەم کەهاوپەیمانی ئێمەی بەدواوە بێت و بەربڵاوی ئەوان؟

معاویە وتی: بەڵێ.

عەمرۆعاص وتی: قورئانەکان هەڵدەکەین و ئەوەی لەناویدایە نیشانی دەدەین و دەڵێین: ئەمە لەنێوان ئێمەدا داوەر بێت. ئەگەر هەندێك لەوان بەم کارە رازی نەبن، لەناو ئەوان دەستەیەك دەبینی دەڵێن: شیاو بۆ ئێمە بەم کارە رازی بین. و لێرەوە دوبەرەکی لەناو ئەوان دروست دەبێت. ئەگەر بەوەی لەقورئانەکاندایە، رازی ببن، بۆ ماوەیەك قورسایی شەڕ لەسەر شانی خۆمان هەڵدەگرین.

خەڵکانی شام قورئانەکانیان کرد بەسەری ڕمەکانەوە و وتیان: فەرمانی خوای گەورە لەناو نوسراوەکەی ئەودایە، لەنێوان ئێمە و ئێوە داوەر بێت. دوای خەڵکانی شام چ کەسێك سنورەکانی شام لەبەرابەر دوژمنان دەپارێزێت؟ دوای عێراقیەکان چ کەسێك سنوری عێراق دەپارێزێت؟ کاتێك خەڵك قورئانەکانیان بینی، وتیان، وەڵامی بانگەوازی نوسراوی خوا دەدەینەوە.

عەلی بەوانی وت: ئەی بەندەکانی خوا، بەدوای راستی و دروستیدا بڕۆن و لەشەڕ

لەگەڵ دوژمن بەردەوام بن چونکە معاویە و عەمرۆعاص و کوڕی ئەبو موعیت و حەبیب و کوڕی ئەبو سەرح و زوحاك نەکاریان بەدینە و نە بەقوڕئان. من باشتر لەئێوە ئەوان دەناسم. لەمناڵیەوە لەگەڵیان بوم تا گەورە بون، خراپترینی مناڵەکان و خراپترینی خەڵکان بون. هاوار لەئێوە! سوێند بەخوا تەنیا لەبەر لاوازی و فریو و فێڵ، قوڕئانەکانیان هەڵکردوە. ئەوان وتیان: توانایی ئەوەمان نیە داوای داوەری قوڕئانمان لێبکەن و ئێمە رازی نەبین.

عەلی پێی وتن: من تەنیا لەبەر ئەوە شەڕی ئەوان دەکەم تا فەرمانبرداری نوسراوی خوابن چونکە ئەوان نافەرمانی فەرمانەکانی خوایان کرد و پەیمانی ئەویان فەرامۆش کرد و نوسراوی خواییان فرێدا و پشت گوێیان خست.

مێسعەر کوڕی فەدەکی تەمیمی و زەید کوڕی حوصەینی تایی و دەستەیەك لەقوڕئان خوێنەکان کەدواتر بونە خەواریج، پێیان وت: ئەی عەلی، کاتێك پێشنیاری داوەری کردنی قوڕئانت پێکرا و گەرنە تۆ و هەمو خەڵکەکەت رادەستی شامیەکان دەکەین تا ئەوبەلاَ بەسەر تۆدا بێنن کەئێمە بەسەر کوڕی عەفاندا هێنامان.

عەلی وتی: دوای ئەم ئاگاداریەی من بۆ رێگرتن لەم کارە، ئەم وتانەی من لەبیر مەکەن، ئەگەر فەرمانی من بەکار دەبەن شەڕیان لەگەڵ بکەن ونەگەر نافەرمانی من دەکەن، هەر کارێك پێتان خۆشە ئەنجامی بدەن.

عەلی یەزید کوڕی هانی بۆ لای ئەشتەر رەوانە کرد و بانگی کرد.

ئەشتەر وتی: ئێستا ئەو کاتە شیاو بۆ تۆ نیە من لەسەر کار لابەریت و لەشوێنەکەم دورم بخەیتەوە. هیوادرام تا ماوەیەکی دیکە خوا لەسەر دەستی من سەرکەوتن بەئێمە ببەخشێت.

یەزید گەڕایەوە و ئەوانی ئاگادار کردەوە. هەراوهوریا و هاوار هاوار لەگۆڕەپانی شەڕی ئەشتەر بەرز بویەوە. خەڵك وتیان: پێمان وایە فەرمانی بەردەوام بون لەشەڕت بەئەشتەر داوە!

عەلی وتی: ئایا بینیتان بەنهێنی لەگەڵ ئەودا قسە بکەم؟ مەگەر بەئاشکرا قسەم نەکرد و هەموتان ئاگادار بون؟

وتیان: کەواتە کەسێك بنێرە تا بگەڕێتەوە وگەرنا سوێند بەخوا تۆ لەسەر کار

لادەبەین.

عەلی وتی: یەزید هاوار لەتۆ! برۆ پێی بڵێ ئاژاوە دروست بوە با بێتە لای من.

ئەشتەر پرسی: ئایا دوای هەڵکردنی قورئانەکان؟ وتی: بەڵێ. مالکی ئەشتەر وتی: سوێند بەخوا گومانم دەکرد ئەم کارە ئاژاوە و دوبەرەکی دروست بکات! ئەمە راوێژی ئەو حەرامزادەیە! سەرکەوتن نابینیت؟ نابینی خەڵکانی شام چۆن کەوتونەتە سوالکردن! نابینی لەدەست ئێمە چی دەکێشن؟ نابینی خوا لەبەرژەوەندی ئێمە چ بەڵایەکی بەسەر هێناون؟ شیاو نیە دەستبەرداری ئەوان بم! ئەشتەر گوێی لەوتەی ئەوان نەگرت و لەسەر شەڕ کردن بەردەوام بو.

یەزید پێی وت: ئایا دەتەوێت سەرکەوتن بەدەست بێنیت بەبەهای ئەوەی عەلی تەسلیم و رادەستی خەڵکانی شام بکرێت تا بیکوژن؟

ئەشتەر وتی: نا، پەنا بەرخوا!

یەزید ئەشتەری لەپەیامی خەڵکان ئاگادار کردەوە. ئەشتەر گەڕایەوە و وتی: ئەی عێراقیەکان، ئەی خواوەندانی ریسوایی و پەستی! ئایا ئەو کاتەی بەسەر ئەم خەڵکدا زاڵبون و دەیانزانی بێ گومان ئێوە سەرکوت کەری ئەوانن، قورئانەکانیان هەڵکرد و پێشنیاری داوەری کردنی قورئانیان پێدان لەگەڵ ئەوەی سوێند بەخوا ئەوان بون نوسراوی قورئانیان پشت گوێ خست و شێوازەکانی پێغەمبەریان پێشێل کرد؟ بەئەندازەی دۆشینی شیر مۆڵەتم پێبدەن چونکە سەرکەوتن بەئاشکرا دەبینم.

وتیان: رازی نابین.

وتی: بەئەندازەی غاردانی ئەسپێکم مۆڵەتم پێبدەن چونکە هیوایی سەرکەوتنم هەیە.

وتیان: ئەگەر ئەم کارە بکەین لەگوناحی تۆدا شەریك دەبین.

ئەشتەر وتی: کەواتە ئاگادارم بکەنەوە چ کاتێك لەسەر بنەمایی راستی و دروستی کارتان کردوە؟ ئایا ئەو کاتەی شەڕتان دەکرد و چاکەکارانتان دەکوژران؟ ئێستا کەدەستتان لەشەڕ هەڵگرتوە، لەسەر راستی و دروستین یا ناڕاستی؟ کەواتە کوژراوەکانی ئێوە کە لەپێشیان لەبەرچاو ناگرن و لەئێوە باشترن، لەدۆزەخدان.

وتیان: ئەی ئەشتەر وازمان لێبێنە و برۆ، لەرێگەی خوادا شەرمان لەگەڵ کردن و

لەرێگەی خوادا دەست لەشەڕ هەڵدەگرین!

ئەشتەر وتی: ئێوەیان فریودا و بەفریوەکەیان رازی بون و داوایان کرد دەست لەشەڕ هەڵبگرن و رازی بون. ئەی بەدبەختە بەخت ڕەشەکان! گومانم دەکرد نوێژی ئێوە نوێژی ئەو کەسانەیە پشتیان کردۆتە ئەم دنیایە و شەیدایی بینینی خواوەندن. ئێستا دەزانم جگە لەم دنیا مەبەستێکتان نیە. تف لەئێوە ئەی حەماڵانی پیری وشتری گوخۆر! دوای ئەمە هیچ کات ڕێزداری نابینن. ون بن لەبەرچاوم بەهەمان شێوە کە هەمو ستەمکاران گۆڕی خۆیان ون کرد! ئەوان جوێنیان پێدەدا و ئەم جوێنی پێدەدان. قامچیان لەناوچاوی ئەسپەکەی دەدا و قامچی لەناوچاوی ئەسپەکانیان دەدا. عەلی بەسەر ئەوان هاواری کرد و هەمویان ئارام بونەوە. خەڵك وتیان: رازی بوین قورئان بکەینە داوەری خۆمان و ئەوان.

ئەشعەس کوڕی قەیس هاتە لای عەلی و وتی: دەبینم خەڵك بەداوەری کردنی قورئان رازی بون. ئەگەر دەتەوێت دەڕۆمە لای معاویە تا بزانم چی دەوێت.

عەلی وتی: بڕۆ.

ئەشعەس ڕۆشتە لای معاویە و پرسی بۆ قورئانەکانیان هەڵکردوە؟

وتی: تا ئێمە و ئێوە رو بکەینە ئەو شتەی لەقورئاندا فەرمانی پێدراوە، ئێوە پیاوێکی جێ پەسەندی خۆتان رەوانە دەکەن و ئێمە پیاوێکی خۆمان رەوانە دەکەین و پەیمان لەهەردوکیان وەردەگرین بەپێی نوسراوی خوایی هەڵس وکەوت بکەن و نابێت چاو لەقورئان بپۆشن. دواتر ئێمە لەسەر ئەوە رێکدەکەوین کە ئەم دوانە لەسەری رێککەوتون.

ئەشعەس وتی: راست و دروست ئەوەیە. ئەو هات و عەلی ئاگادار کردەوە. خەڵك وتیان: رازین.

خەڵکانی شام وتیان: عەمرۆعاص هەڵدەبژێرین.

ئەشعەس و ئەوانەی دواتر بونە خەواریج وتیان: ئەبوموسا ئەشعەری هەڵدەبژێرین.

عەلی فەرموی: لەسەرەتاوە نافەرمانی منتان کرد ئێستا نافەرمانی من مەکەن. بەپەسەندی نازانم ئەبو موسا بۆ ئەم کارە دەست نیشان بکەم.

ئەشعەس و زەید کوڕی حوصەین و مێسعەر کوڕی فەدەکی وتیان: جگە لەو بەکەسی دیکە رازی نابین چونکە لەوەی پێشهاتوە، پێشتر ئێمەی ئاگادار کردبویەوە.

عەلی وتی: ئەو بڕواپێکراو نیە. خۆی لەمن دورخستەوە و رێگر بو لەهاوکاری کردنی خەڵك بۆ من و دواتر هەڵات تا ئەوەی دوای چەند مانگ ئەمانم پێبەخشی. من عەبداللە کوڕی عەباس بۆ ئەم کارە دەستنیشان دەکەم.

وتیان: سوێند بەخوا کێشەمان نیە تۆ بیت یا کوڕی عەباس! تەنیا بەکەسێك رازی دەبین لەبەرابەر تۆ لەگەڵ معاویە یەکسان بێت (نە پشتیوانی تۆ بێت نەمعاویە)

عەلی وتی: من مالکی ئەشتەر دەست نیشان دەکەم.

وتیان: ئایا ئەشتەر نیە سەراسەر زەوی کردۆتە ئاگر؟

عەلی وتی: جگە لەئەبو موسا کەس پەسەند ناکەن؟

وتیان: پەسەند ناکەین.

وتی: چیتان دەوێت، بیکەن.

کەسیان بۆلای ئەو نارد کە لەعۆرز بو وبەشداری شەڕەکانی نەدەکرد. کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی هاتە لای و پێی وت: خەڵك ئاشتیان کرد. ئەبوموسا وتی: سوپاس بۆ خوا. کۆیلە وتی: تۆیان کرد بەداوەر. ئەبوموسا وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). ئەبو موسا هات و ڕۆشتە ناو سوپا.

ئەشتەر هاتە لای عەلی و وتی: من بۆ کوشتنی عەمرۆ عاص راسپێرە چونکە سوێند بەخوا هەر ئەوەندەی ببینم، بێ چەند و چون دەیکوژم.

ئەحنەف کوڕی قەیس هات و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەردی سەر زەویان بۆ تۆ هاویشتوە. من ئەبوموسام تاقی کردۆتەوە و لەهەر دو مەمکی ئەو شیرم دۆشیوە. ئەوپیاوێکە لێواری تەنك و قوڵایی کەمە. بۆ ئەم خەڵکە تەنیا پیاوێك شیاوە بڕواتە لایان و لەناو دەستیاندا جێگەی ببێتەوە و لەوان دور ببێتەوە تا وەك ئەستێرەیەك لەدوری ئەو رەنج ببەن. ئەگەر ناتەوێت من بکەیتە داوەر، من بکەرە کەسی دوەم یا سێیەم تا عەمرۆعاص هیچ گرێیەك لێنەدات مەگەر ئەوەی بیکەمەوە و گرێیەکی بەهێزتر گرێ بدەم.

خەڵك تەنیا بەئەبوموسا ئەشعەری و نوسراوی خوا رازی دەبون. ئەحنەف وتی:

ئەگەر تەنیا بەئەبو موسا رازی دەبن، پشتی بەپیاوەکانی دیکە گەرم بکەنەوە. عەمرۆ عاص هاتە لای عەلی تا بەبونی ئەو پەیمانەکە ببەستێت. نوسیان: ((بەناوی خوای گەورە و مێهرەبان، ئەمە پەیمانێکە لەنێوان سەروەری باوەڕداران........))

عەمرۆ عاص وتی: ناوی خۆی و باوکی بنوسە، ئەو سەروەری ئێوەیە، سەروەری ئێمە نیە.

ئەحنەف وتی: سەروەری باوەڕداران مەسڕەوە چونکە ئەگەر بیسڕیتەوە هیچ کات ناگەڕێتەوە بۆ لای ئێوە، مەیسڕەوە هەرچەندە خەڵك یەکتر کوشتار بکەن.

عەلی ماوەیەك تێفکری. دواتر ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: ئەم وشەیە بسڕەوە. وشەی (سەروەری باوەڕداران سڕایەوە) عەلی وتی: پەنا بەرخوا، کردارێك لەبەرابەر هەمان کردار! سوێند بەخوا من رۆژی ئاشتی حودەیبیە دەبیری پێغەمبەر بوم و نوسیم ( پەیمانێك لەنێوان محەممەد پێغەمبەری خوا) بتپەرستەکان وتیان: پێغەمبەری خوا نیت، ناوی خۆت و ناوی باکوت بنوسە. پێغەمبەر پێی وتم: ئەو وشەیە بسڕەوە، وتم: ناتوانم. وتی: ئەو وشەیە نیشانی من بدە. من وشەکەم نیشاندا و بەدەستی خۆی سڕیەوە و وتی: لەداهاتودا داوای ئەم کارە لەتۆ دەکەن و تۆ پێی رازی دەبیت.

عەمرۆ عاص وتی: پەنا بەرخوا! ئێمە و ناباوەڕان وەك یەك لەقەڵەم دەدەیت لەگەڵ ئەوەی هەمومان باوەڕمان بەخوا هەیە!

عەلی وتی: ئەی کوڕی نابیغە، کام رۆژە بوە پشتیوانی خراپەکاران و دوژمنی خواپەرستەکان نەبویت؟

عەمرۆ عاص وتی: سوێند بەخوا دوای ئەمڕۆ هیچ کۆڕ و کۆبونەوەیەك من و تۆ کۆناکاتەوە.

عەلی وتی: هیوادارم خوا من لەکۆڕی تۆ و کەسانی وەك تۆ دور بخاتەوە.

پەیمانەکە بەمشێوەیە نوسرا: (( ئەمە پەیمانێکە لەنێوان عەلی کوڕی ئەبی تالب و معاویە کوڕی ئەبی سوفیان لەسەری رێککەوتون. عەلی لەلایەن خەڵکی عێراق و هاورێکانی و معاویە لەلایەن خەڵکی شام و هاورێکانی. ئێمە لەبەرابەر خوا و نوسراوەکەی سەردادەنەوێنین. هیچ شتێك جگە لەنوسراوی خوا نابێتە داوەر

لەنێوانمان. لەنێوان ئێمە نوسراوی خوا لەسەرەتاوە تا کۆتایی دەبێتە داوەر وئەوەی زیندوی کردۆتەوە، بەزیندویی دەیهێڵینەوە وئەوەی مراندویەتی، دەیمرێنین. ئەوەی دو داوەرەکە، ئەبوموسا عەبداللە کوڕی قەیس و عەمرۆ کوڕی عاص، لەنوسراوی خوا بیدۆزنەوە، لەسەر ئەو بنەمایە کارەکانیان ئەنجام دەدەن و ئەوەی لەقورئاندا هەستی پێنەکەن لەشێوازێکی دادپەروەرانەی گشتگیر دور لەدروست کردنی جیایی، کەڵکی لێوەردەگرن. دو داوەر لەعەلی و معاویە و دو سوپاکە پەیمانیان وەرگرت کەگیانی خۆیان و کەسەکان و خزم و بنەماڵەکەیان لەئەماندایە. خەڵك لەداوەری کردنی ئەوان پشتیوانیان دەبن. پەیمان و سوێندی خوایی لەئەستۆی دو داوەرەکەیە تا لەنێوان ئەم ئۆمەتە داوەری بکەن و گیرۆدەی جەنگ و دوبەرەکیان نەکەن. دەسپێکی دەستپێکردنی کارەکەیان مانگی رەمەزان (حەوت مانگ دوای دەسپێکردنی ئاگربڕ، فەوریەی ٦٥٨ زایینی) دەبێت و ئەگەر بیانەوێت، بۆ ماوەیەکی دیکە دوای بخەن، ئەو کارە دەکەن. شوێنی داوەری کردن بەشێوەیەك دیاری دەکرێت بەیەك ئەندازە لەخەڵکی عێراق و شامەوە و دور بێت.

لەلایەن عەلیەوە ئەم کەسانە پەیمانەکەیان واژۆ کرد و شایەتیان دا: ئەشعەس کوڕی قەیسی هەمەدانی، رفا کوڕی سومەیی بەجەلی، عەبداللە کوڕی موحێلی عێجلی، حوجر کوڕی عودەی کەندی، عەبداللە کوڕی توفەیلی عامری، عوقەبە کوڕی زیادی حەزرەمی، یەزید کوڕی حوجەییە تەمیمی و مالك کوڕی کەعبی هەمەدانی. کەسانی معاویە ئەمانە بون: ئەبو ئەعوەری سەلەمی، حەبیب کوڕی موسلیمە، زیمل کوڕی سوبیەع کوڕی یەزیدی ئەنساری عوتەبە کوڕی ئەبی سوفیان و یەزید کوڕی حوڕی عەبەسی.

بەمالکی ئەشتەری نەخەعیان وت ناوی خۆی لەژێر پەیمانەکەدا بنوسێت. وتی دەستی راستم نەبێت و دەستی چەپم هیچ سودێك بەمن نەبەخشێت ئەگەر ناوێك لەمن لەم پەیمانی ئاگربڕەدا بێت. مەگەر من بەڵگەیەکی رونم لەخواکەی خۆم پێ نیە کەدوژمنەکەم گومڕایە؟ مەگەر سەرکەوتنتان بەچاوی خۆتان نەبینی؟

ئەشعەس پێی وت: سوێند بەخوا من هیچ سەرکەوتنێکم نەبینی، پەیوەستی ئێمە بەچونکە هیچ رێگایەکی دیکەت لەبەردەمدا نیە.

ئەشتەر وتی: سوێند بەخوا هەیە، پشت لەئێوە و ئەم جیهانە دەکەم و ڕێگای ئەو دنیا دەگرمە بەر. خوا بەشمشێرەکەی من خوێنی ئەو پیاوانەی ڕشت کە تۆ لەهیچیان باشتر نیت و خوێنت لەهیچیان ڕێزدارتر نیە.

دەڵێت: وەك بڵێی خوا جامێك ئاسنی تواوەی کرد بەروخساری ئەشعەسدا. ئەشعەس پەیمانەکەی خۆی دەرهێنا و بەردەوام بۆ خەڵکی دەخوێندەوە. لای دەستەیەك لەبەنی تەمیم تێپەڕی کرد و عروە کوڕی ئودەیە برای ئەبو بیلال لەناویاندا بو. پەیمانەکەی بۆ ئەوان خوێندەوە. عروە وتی: ئایا پیاوان لەکاری خوا دەکەنە داوەر؟ فەرمان و داوەری جگە لەخوا بۆ کەس شیاو نیە (لاحکم الا الله). دواتر شمشێرەکەی هەڵگرت و بەهێواشی لەدواوەی ئەسپەکەی ئەشعەسیدا و چوارپێکە بۆ پێشەوە غاریدا. هاوڕێیانی ئەشتەر بانگیان کرد و گەڕایەوە. خەڵکی ئەشعەس و زۆر لەخەڵکانی یەمەن بۆ ڕێزگرتن و پاراستنی ئەشعەس توڕە بون. ئەحنەف کوڕی قەیس و مێسعەر کوڕی فەدەکی و خەڵکانێك لەتەمیم ڕۆشتن و داوای لێبوردنیان کرد و ڕازی بو و دواتر سوپاسی خوای بەجێهێنا.

پەیمانەکە لەرۆژی چوارشەممە سیانزەی صەفەری ساڵی سی و حەوت /٣١ ژوئیەی ٦٥٧ زایینی نوسرا. لەسەر ئەوە ڕێککەوتن عەلی کوڕی ئەبی تالب لەمانگی رەمەزان/فەرویەی ٦٥٨ زایینی بڕواتە جێگەی کۆبونەوەی داوەران لەدومەئەلجەندەل یا ئەزرۆح. بەعەلیان وت: ئەشتەر پەیمانەکە پەسەند ناکات و جگە لەشەڕ لەگەڵ ئەوان هیچ ڕێگایەکی دیکە ناناسێت.

عەلی وتی: سوێند بەخوا منیش ئەو بڕوا و بۆچونم هەیە و ئەمویست ئێوە بەوە رازی بن. ئێستا کە لەهەر کارێك جگە لەئاگر بڕ خۆتان بەدور دەگرن، من بەوە رازی بوم. ئەدوای ڕازی بون، گەڕانەوە ڕەوایە و ئەدوای پەسەند کردن گۆڕانکاری کردن شیاو. مەگەر ئەوەی لەبەرابەر خوا دەست بۆ گوناح درێژ بکەن یا نوسراوەکانی بخەنە ژێر پێ. لەگەڵ هەر کەس فەرمانی خوای خستە ژێرپێ، شەڕ بکەن. بەڵام ئەوەی سەبارەت بە سەرپێچی کردن لەفەرمانی من و خۆ دورخستنەوە لەکاری من وتتان، ئەو لەم خەڵکانە نیە و من لەم کارەی ئەو ترسم نیە و ناڕەنجێم. خۆزگە لەناو ئێوەدا دوکەسی هاوشێوەی ئەو دەبون. خۆزگە لەناو ئێوەدا یەك کەسی هاوشێوەی ئەو

دەبو و بەهەمان شێوەدوژمنی دەبینی کەمن دەیبینم. لەم کاتەدا دەبو قورسایی کاروبارەکانی ئێوە لەسەر شانی من سوك دەبو و دەمتوانی چەوتی و ناڕاستیەکان بۆ راستی بگۆڕم. ئێوە لەم گێژاوی لەناوچونە رزگار بکەم بەلاّم نافەرمانی منتان کرد. من و ئێوە ئێستا بەو شێوەین کەشاعیری هوازین وتویەتی:

و هل انا الا من غزية ان غوت غويت و ان ترشد غزية ارشد

یانی: ئایا مەگەر من پیاوێك لەغەزیە نیم؟ ئەگەر غەزیە گومڕا بێت، گومڕا دەبم و ئەگەر بۆ رێگەی راست بگەڕێتەوە، بۆ رێگەی راست دەگەڕێمەوە.

سوێند بەخوا کارێکی ئەوتۆتان کرد کەهێزێکی لەیەك پچڕاند و توانایی تێکشکاند و سستی و ریسواییەکی گیان ستێنی لەجێگەی هەردوکیاندا جێگیر کرد. کاتێك گەیشتنە لوتکەی سەرکەوتن و دوژمنانتان لەترسی لەناوچون لەرز دایگرتن و کوشتاری فراوان رەگ و ریشەی هەڵتەکاندن و ئازاری برینی ئێوەیان تا مێشکی ئێسقانەکانیان چێشت، قورئانەکانیان کرد بەسەری رمەکانەوە و پێشیناری داوەری کردنی قورئانیان پێدان تا ئێوە لەکارەکەی خۆتان دور بخەنەوە و سەرکەوتن لەشەڕ بۆ دۆڕان لەشەڕ بگۆڕن و لەسەر رێگەی ئێوە دانیشن و چاوەڕوانی مەرگی ئێوە بکەن. ئەم کارەیان بەفێڵ و فریو کرد و ئێوە ئەوەی بەبەهایەکی گران دەیانخواست، هەرزان پێشکەشی ئەوانتان کرد و لەهەر کارێك جگە لەوە خۆتان بەدور گرت کە لەگەڵ دوژمن رێك بکەون و پەنایان بدەن. سوێند بەخواوەندی خوا گومان ناکەم دوای ئەمە بۆ رێگەی راست بگەڕێنەوە یا هەست بەدەروازەکانی دورئەندێشی بکەن..

دواتر خەڵك لەصەفین گەڕایەوە. کاتێك عەلی گەڕایەوە (حەروریان) رێگەی ناسازگاریان گرتەبەر و رێگەی خۆیان لەخەڵکان جیا کردەوە. ئەمە یەکەم کار بو دروستیان کرد و هەڵبژاردنی داوەریان بەکارێکی ناڕەوا لەقەڵەمدا و بەرێگایەکی دیکەدا ڕۆشتن. لەرێگەی وشکاییەوە هاتن و بونە دوژمن و خراپەخواز و تورە بون. ژەهری هەڵبژاردنی داوەر کاریگەری لەسەر ناخی ئەوان دانا. رێگەیان لەیەك دەگرت و جوێن و قسەی ناشیرینیان بەیەك دەوت و بەقامچی لەیەکیان دەدا. خەواریج وتیان: ئەی دوژمنانی خوان لەکاری خوادا لاوازیتان کرد. کەسانیتر دەیانوت: لەرێبەرەکەی ئێمە جیابونەوە و بلاّوبونەوەتان لەناو دەستەکەی ئێمەدا دروست کرد و پەیوەندی و

پەیوەست بونی ئێمەتان بۆ پچڕان گۆڕی.

خەڵك بەرێکەوتن تا لەنۆخەیلە تێپەڕین و ماڵەکانی کوفەیان بینی. پیرەپیاوێك لەسێبەری ماڵێکدا خەوتبو و نیشانەکانی نەخۆشی بەرەوخساریەوە ئاشکرا. عەلی سلاوی لێکرد و پیرە پیاو بەنەرمی وەلامی دایەوە. عەلی وتی: روخسارت بەگۆڕاو دەبینیم، ئایا لەنەخۆشیە؟

وتی: بەڵێ.

عەلی وتی: دەتوانیت نەخۆشیەکەت پەسەند نەکەیت.

وتی: بەلام حەزم نەکرد کەسی دیکە گرفتاری ئەم نەخۆشیە بێت.

عەلی وتی: لەوەی گرفتاری پێی، هیوایی چاکبونەوە و پاداشت هەیە؟

وتی: هەمە.

عەلی وتی: مژدەت لێ بێت بەلێخۆشبونی خواوەندی مێهرەبان و بەخشینی گوناحەکان، ئەی بەندی خوا، تۆ کێیت؟

وتی: سالح کوڕی سەلیم (چاکەکار کوڕی تەندروست)

عەلی وتی: لەکام خەڵکانەیت؟

وتی: نەژادی من بۆ سەلامانی تەی دەگەڕێتەوە و لەرێگەی داواخوازی و پەنابەرێتی لەناو خەڵکی سەلیم کوڕی مەنسور دەژیم.

عەلی وتی: پەنا بەرخوا! چەندە جوانە ناوی خۆت و ناوی باوکت و ناوی نەژاد و ناوی پەنادەرەکانت! ئایا لەم شەڕەدا لەگەڵ ئێمە بویت؟

وتی: نە، حەزم دەکرد شان بەشانی تۆ بەشداری بکەم، بەلام ئەم (تا)ی کەدەیبینی، رێگری لێکردم.

عەلی وتی: ناتەوانان و نەخۆشان و ئەو کەسانەی جگە لەهەزینە کردن هیچ رێگایەکی دیکە شك نابەن، گوناحیان لەسەر نیە ئەگەر چاکەخوازی پێغەمبەر و خوا بن، چاکەکاران گوناحیان لەسەر نیە و خواوەند بەخشەر و مێهرەبانە (تۆبە/٩١/٩) ئاگادارم بکەرەوە خەڵك سەبارەت بەوەی لەناو ئێمە و شامیەکان رویداوە، چۆن قسە دەکەن.

وتی: کەسانێك لەناو ئەوان شادمانن و ئەوان خەڵکانێکی پاکن. لەناو ئەواندا

کەسانێك هەن داخ و کەسەر دەخۆن بۆ ئەو پێشهاتەی لەنێوان تۆ و ئەواندا رویداوە. ئەوان ئەو دەستە لەخەڵکن کەچاکەی تۆیان دەوێت.

عەلی وتی: راستت وت. دەخوازم ئەوەی گلەیی لێدەکەیت، خوا بیکاتە هۆکاری بەخشینی گوناحەکانت. چونکە نەخۆشی پاداشی نیە بەڵکو هەمو گوناحەکانی مرۆڤ دەسڕێتەوە. پاداش لەوتار و لەزمان و کار و شەڕ لەدەست و قاچەدایە. خواوەند دەستەیەکی فراوان لەبەندەکانی بەنەندێشەی چاك و کرداری راست، رەوانەی بەهەشت دەکات.

کەمێکی دیگە رۆشت و چاوی بەعەبداللە کوڕی وەدیعەی ئەنساری کەوت. عەلی لێی نزیك کەوتەوە و سلاوی لێکرد و هاوڕێ لەگەڵ ئەو کەوتەرێ. پێی وت: لەخەڵکان سەبارەت بەئێمە چیت بیستوە؟

وتی: دەستەیەك دەسخۆشیتان لێدەکەن و دەستەیەك پەسەندی ناکەن.

وتی: بیرمەندان چی دەڵێن؟

وتی: دەڵێن: عەلی دەستەیەکی فراوان خەڵکی لەدەوری کۆببوەوە کەبلاوەی پێکردن و قەلایەکی بەهێز بو کەوێرانی کرد. کێ دەتوانێت ئەوەی بلاوەبوۆتەوە، کۆبکاتەوە و چۆن دەتوانێت ئەوەی خاپوری کردوە، نۆژەن بکاتەوە؟ ئەگەر ئەو کاتەی نافەرمانان لەبەرابەر ئەو شۆڕشیان کرد، بەهاوکاری فەرمانبەران شەڕی لەگەڵ دەکردن تا سەردەکەوت یا دەکوژرا، لەدورئەندێشی نزیکتر دەبو.

عەلی وتی: من وێرانم کرد یا ئەوان؟ من پەیوەست بونم پچڕاند یا ئەوان؟ بەلام ئەوەی وتیان: دەبێت بەهاوکاری فەرمانبەران شەڕی لەگەڵ نافەرمانان دەکرد تا سەردەکەوت یا دەکوژرا، سوێند بەخوا ئەم کارە لەگومانی من دور نەبو. من بەئاسانی گیانم دەبەخشی وچاوم لەم جیهانە دەپۆشی و بەدڵخۆشیەوە پێشوازیم لەمەرگ دەکرد. جارێکیان سەرسەختانە بڕیارمدا هێرشیان بکەمە سەر، بەلام سەیری ئەم دوانەم کرد( حەسەن و حسێن) و خۆیان خستە ئامێزی من و ئەم دوانە یانی عەبداللە کوڕی جەعفەر و محەممەد کوڕی عەلیم بینی خۆیان بەداوێنی منەوە هەڵواسی. ئەگەر ئەم دوانە لەناوبچن، نەژادی پێغەمبەر لەناو ئەم ئۆمەتە لەناو دەچێت. ئەمەم پەسەند نەکرد و نەمتوانی رێگە بدەم ئەم دوانە لەناو بچن، سوێند بەخوا ئەگەر

دوای ئەمە روبەرویان ببمەوە، لەهیچ سوپا یا ماڵێك هاورێیەتیان ناکەم.

دواتر بەرێکەوت و بینی لەلای راست و چەپی خۆی حەوت یا هەشت گۆڕە. عەلی پرسی: ئەمە چیە؟

پێیان وت: ئەی سەرومری باوەڕداران، خەباب کوڕی ئەرەت دوای رۆشتنی تۆ بۆ شەڕ ماڵئاوایی لەجیهان کرد و پێشنیاری کرد لەدەرەوەی شار بەخاکی بسپێرن. ئەو یەکەم کەس بو لەدەرەوەی شار بەخاك سپێردرا و دواتر خەڵکان لای ئەو بەخاك سپێردران و ئەم شوێنە بو بەگۆڕستانێکی گشتی.

عەلی وتی: خوا لەخەباب خۆش بێت چونکە لەگیان و دڵەوە باوەڕی بەئیسلام هێنا و بەدڵخوازیەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد و ژیانی بەکار و شەڕ بەسەر بردو جەستەی گرفتاری چەندین تاقی کردنەوە بویەوە، بەڵام هیچ کات خوا پاداشی چاکەکارانی بەفیرۆ نەدا. سەرومری باوەڕداران وەستا و وتی: سڵاو لەئێوە ئەی پاشماوەکانی ماڵە ترسێنەرەکان، گەڕەکەکانی خاڵی لەخاوەنەکان، سڵاو لەئێوە ژنان و پیاوانی باوەڕدار! ئێوە پێشڕەوانن کەپێش ئێمە ڕۆشتنە شوێنی حەوانەوە و ئێمە شوێنکەوتوانی ئێوەین و بەزویی دەگەینە لای ئێوە! خوایە، لەئێمە وئەوان خۆشببە و بەبەخشینەکانی خۆت چاوپۆشی لەگوناحەکانی ئێمە و ئەوان بکە.خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی بیر لەمردن دەکاتەوە و بۆ رۆژی هەستانەوە کار دەکات و پاشەکەوت دەکات و لای خوای گەورە و رێزدار بەرەزامەندی دەژیت. دواتر بەرێکەوت تا گەیشتە گەڕەکی سەوریان و ئاوازی گریانی بیست. پرسی: ئەم گریانە چیە.

وتی: گریان بۆ کوژراوانی صەفین.

وتی: ئاگادار بن و بزانن من بۆ هەر کەسێك لەوان کە بەخۆڕاگری و بۆ رەزامەندی خوا شەڕی کردوە، شایەتی دەدەم لەبەهەشتیەکانە. دواتر لای گەڕەکی فایشیان تێپەڕی کرد و بەهەمان شێوە دەنگی شین و زاری بیست. لای گەڕەکی شەبامیان تێپەڕی کرد و دەنگی گریانی بیست. لەوێ وەستا. حەرب کوڕی شورەحبیلی شەبامی هاتە لای ئەو. عەلی پێی وت: ئایا ژنەکانتان بەسەر ئێوەدا زاڵ دەبن؟ رێگەی گریان و شینیان لێ ناگرن؟

وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران، ئەگەر یەك یا دو ماڵ دەبو، دەمانتوانی، بەڵام لەم

گەڕەکە سەد و هەشتا پیاو کوژراوە. هیچ ماڵێك نیە مەگەر ئەوەی دەنگی گریانی لێ بەرز ببێتەوە. بەڵام ئێمە پیاوان ناگرین و لەگیاندان لەرێگەی خوادا شادمان دەبین.

عەلی وتی: خوا لەکوژراوەکان و مردوەکان خۆش بێت! ئەو پیادە بەرێکەوت و عەلی سوارە. عەلی پێی وت: بگەڕێرەوە. وەستا و دوبارە پێی وت: بگەڕێرەوە چونکە پیادە رۆشتنی کەسێکی وەك تۆ لای سوارەیەکی وەك من، هۆکاری فریودانی فەرمانڕەوایی و ریسوابونی باوەڕداریە. دواتر رۆشت و گەیشتە گەڕەکی ناعیتیان کەزۆرینەی ئەوان لایەنگری عوسمان بون. لەسوچ و قوژبنێك بیستی کەسێك دەڵێت: سوێند بەخوا عەلی هیچی نەکرد و رۆشت و بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە. کاتێك ئەویان بینی، هەرکام خۆیان لەسوچێکدا داشارد. عەلی بەهاوەڵانی خۆی وت: پیاوانی وای لێیە، شامیان نەبینیوە. دوبارە بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەوانەی پێشتر بینیمان، لەمانە باشتر بون. وتی:

| اخوك الذى ان اجرضتك ملمة | من الدهر لم يبرح لبثك واجما |
|---|---|
| و ليس اخوك بالذى ان تشعبت | عليك الامور ظل يلحاك لائما |

یانی: برای تۆ ئەو کەسەیە ئەگەر پێشهاتێکی بەئازار بۆ تۆ داباری، بەردەوام لەخەمی تۆ خەمبار بژیت. ئەو کەسە برای تۆ نیە ئەگەر کارەکان لەیەك هەڵوەشێن و لەتۆ بناڵێن، سەرکۆنەی تۆ بکات.

بەرێکەوت و بەردەوام ناوی خوای دەهێنایە سەرزمان تا رۆشتە ناو کۆشك. کاتێك رۆشتە ناو کوفە، خەواریج لەگەڵ ئەو نەرۆشتنە ناو شار بەڵکو رویان لەحەرورا کرد و لەوێ دابەزین.

کوژراوەکانی صەفین دەستەیەکیان بەمشێوەیە بون: ئەویسی قەرەنی لەصەفین کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نیە بەڵکو لەئەرمەنستان یا لەسیستان مرد.

هەروەها لەم شەڕەدا جەندەب کوڕی زوهەیری ئەزدی لەهاوەڵانی پێغەمبەر لەسوپاکەی عەلیدا کوژرا.

حابس کوڕی سەعدی تایی خاڵی یەزید کوڕی عودەی کوڕی حاتەم لەشەڕی صەفین لەناو سوپاکەی معاویەدا کوژرا. یەزید کوڕی عودەی ناجوامێرانە بکوژەکەی ئەوی کوشت. عودەی ویستی ئەو بەدەستی بنەماڵەی کوژراو بسپێرێت بەڵام رایکردە لای

معاویە.

لەو کەسانەی لەشەڕی صەفین لەسوپاکەی عەلیدا کوژران، حوزەیمە کوڕی سابت زونەلشەهادەتەین بو. ئەو دەستی بۆ شمشێرەکەی نەبرد بەڵام کاتێك عەماری یاسر کوژرا، شمشێری دەرکێشا و شەڕی کرد تا کوژرا. وتی: لەپێغەمبەری خوام بیست دەیوت: عەمار بەدەستی سوپای ستەمکار دەکوژرێت.

هەروەها لەگەڵ عەلی، سوهەیل کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەبی عەمرۆی ئەنساری لەشەڕ کەرانی بەدر کوژرا.

لەوکەسانەی لەم شەڕەدا بەشداریان کرد و کوژران، یەکیان خالید کوڕی وەلید لەئەنسار و لەهاوەڵانی پێغەمبەر بو.

## دانانی جەعدە کوڕی هوبەیرە لەخوراسان

لەم ساڵەدا، دوای گەڕانەوە لەشەڕی سەفین، عەلی جەعدە کوڕی هوبەیرەی مەخزومی وەك فەرماندار رەوانەی خوراسان کرد. ئەو گەیشتە نەیشابور و بینی خوراسانیەکان لەدین هەڵگەڕاونەتەوە و سەنگەریان گرتوە. گەڕایەوە بۆ لای عەلی. ئەو خولەید کوڕی قەری یەربوعی رەوانە کرد. خولەید خەڵکەکەی گەمارۆدا و بەئاشتی لەگەڵی سازان و خەڵکانی مەرویش پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست.

## خۆدورخستنەوەی خەواریج لەعەلی و گەڕانەوەی ئەوان بۆ لای عەلی

کاتێك عەلی لەشەڕی صەفین گەڕایەوە، خەواریج لێی جیابونەوە و ڕۆشتنە حەروەرێ و دوانزە هەزار کەس لەوان لەوێ دابەزین. جارچی ئەوان جاڕیدا: فەرماندەی کاروباری شەڕ شەبەس کوڕی رەبعیە، پێشنوێژ عەبدالله کوڕی کەوا ی یەشکری، فەرمانڕەوایی لەدەستی ئەنجومەنی راوێژ کردن (دوای سەرکەوتن)، بەیعەت لەگەڵ خوای گەورە و کاری بنچینەیی و بنەڕەتی، ئەمر کردن بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپەیە.

کاتێك عەلی و هاورێکانی ئەمەیان بیست، شوێنەکەوتوانی ئەو هەستان و وتیان: بەیعەتێکی دیکە لەئەستۆی ئێمەدایە. ئێمە ئەو کەسەمان خۆش دەوێت کەتۆی

خۆشت بوێت و دوژمنی ئەو کەسەین دوژمنی تۆ بێت.

خواریج وتی: ئێوە و شامیەکان وەك دو ئەسپی گرێو بەستو، بەرەو ناباوەڕی غارتاندا. خەڵکانی شام لەگەڵ معاویە لەسەر بنەمایی ئەوەی بیانەوێت و نەیانەوێت، بەیعەتیان کرد و ئێوە لەگەڵ عەلی لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەتتان کرد ئەو کەسەتان خۆش بوێت کەخۆشی دەوێت و دوژمنی ئەو کەسە بن کەبەدوژمنی دەزانێت.

زیاد کوڕی نەزر بەوانی وت: سوێند بەخوا هەرجار کەعەلی دەستی هێنا و ئێمە بەیعەتمان لەگەڵ کرد، لەسەر بنەمای فەرمانی خوایی و شێوازی پێغەمبەر پەیمانمان لەگەڵ بەست. بەڵام چونکە ئێوە لەگەڵ ئەو ناسازگاریتان کرد، شوێنکەوتوانی هاتنە لای و وتیان: ئێمە ئەو کەسانەمان خۆش دەوێت و دوژمنی ئەو کەسەین تۆ بەدوژمنی بزانیت. ئێمەیش بەهەمان شێوەین. ئەو لەگەڵ راستی و دروستی و رزگاریە و هەر کەس لەگەڵ ئەو ناسازگارە، گومڕا و گومڕاکەرە.

عەلی عەبدالله کوڕی عەباسی بۆ لای خەواریج رەوانە کرد وپێی وت: لەوەڵامدانەوە و شەڕ لەگەڵ ئەوان پەلە مەکە تا بگەمە لای تۆ. عەبدالله روی کردە ئەوان و ئەوان رویان تێکرد و دەستیان بەگفتوگۆ کرد. ئەو خۆڕاگری نەکرد و بەتوندی لەگەڵ ئەوان قسەی کرد و وتی: لەداوەرەکان چ دڵرەنجانێکتان هەیە لەکاتێکدا خوای گەورە فەرمویەتی: ئەگەر دو داوەر خوازیاری چاکسازی بن، خوا لەنێوان ئەوان چاکسازی دروست دەکات (نسا /٣٥/٤)، چ بگات بەئۆمەتی محەممەد.

خەواریج وتیان: بەڵام ئەوەی خواوەند فەرمانەکەی داوەتە دەست خەڵك و فەرمویەتی لێی ورد ببنەوە، بەوانە و خەڵك دەتوانن هەرکارێك بیانەوێت، ئەنجامی بدەن. ئەوەی فەرمویەتی و رەوانەی کردوە، بۆخەڵکان رەوانیە گۆڕانکاری تیا دروست بکەن. سەبارەت بەزیناکار فەرمانیداوە، سەد قامچی لێبدەن و سەبارەت بەدز فەرمانی داوە دەستی ببڕن. شیاو نیە بۆ بەندەکان گۆڕانکاری لەم فەرمانانەدا بکەن و یا کەم و زیادی بکەن.

کوڕی عەباس وتی: خوای گەورە دەڵێت: لەمبارەوە دو پیاوی دادپەروەر فەرمان دەدەن (مائدە/٩٥/٥).

خەواریج وتیان: ئایا ڕاو و کشتوکاڵ و کاری ژن و پیاو لەگەڵ خوێنی موسوڵمانان

یەکسان دەکەیت؟ دوبارە پێیان وت: ئایا عەمرۆ عاص کە تادوێنی شەڕی لەگەڵ ئێمە دەکرد، دادپەروەرە؟ ئەگەر ئەو دادپەروەرە، ئێمە دادپەروەر نین. لەکاری خوادا پیاوانتان کردە داوەر لەگەڵ ئەوەی خوا فەرمانی خۆی سەبارەت بەمعاویە و هاوڕێکانی ناردوە کەدەبێت بکوژرێن یا بۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێنەوە. ئێوە لەنێوان خۆتان پەیمانێکتان نوسی و ئاگربڕتان سەقامگیر کرد. خوا لەو کاتەی بێزاری (سورەی تۆبەی) ڕەوانە کرد، ئاگربری لەگەڵ ناباوەڕانی شەڕکەر ناڕەوا کرد مەگەر ئەو کەسەی باجی بدات.

عەلی یەزید کوڕی نەزری ڕەوانە کرد و پێی وت: بزانە لەدەوری کام سەرکردەیان زیاتر کۆدەبنەوە. ئەو ئاگاداری کردەوە کە لەدەوری یەزید کوڕی قەیس زیاتر کۆدەبنەوە.

عەلی لەگەڵ خەڵك ڕۆشتەدەر تا گەیشتە لای ئەوان و ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی یەزید کوڕی قەیس. لەوێ دو ڕەکەعەت نوێژی خوێند و وەك فەرمانداری ئیصفەهان و ڕەی دەست نیشانی کرد. دواتر ڕۆشت تا گەیشتە ئەوان و بینی سەرقاڵی گفتوگۆن لەگەڵ کوڕی عەباس. فەرموی: مەگەر فەرمانی گفتوگۆ نەکردنم بەتۆ نەدا؟ وتی: ئەی خوایە، ئەمە ئەو پێگەیە هەر کەس تیایدا سەرکەوێت، لەرۆژی هەستانەوە ڕزگاری دەبێت. دواتر بەوانی وت: ڕێبەرەکەتان کێیە؟

وتیان: کوڕی کەوا

پرسی: بۆ خۆتان لەئێمە دورخستۆتەوە؟

وتی: لەبەر ڕازی بونی تۆ بەهەڵبژاردنی داوەر لەشەڕی صەفین.

عەلی وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا، مەگەر ئەوان قورئانیان نەکرد بەسەر ڕمەکان و ئێوە وتتان وەڵامیان دەدەینەوە، بەئێوەم وت من باشتر دەیانناسم، ئەوان شوێنکەوتەی هیچ دینێك نین؟ عەلی قسەکانی خۆی لەو ڕۆژەدا بیرخستنەوە. دواتر وتی: پەیمانمان لەم دو داوەرە وەرگرت ئەوەی قورئان زیندوی کردوە، بەزیندویی بیهێڵنەوە وئەوەی بەفیرۆدراوە، بەفیرۆی بدەن. ئەگەر لەسەر بنەمای قورئان داوەری بکەن شیاو نیە بۆ ئێمە ناسازگاریان لەگەڵ بکەین و ئەگەر لەسەر بنەمای قورئان داوەری نەکەن، ئێمە لەفەرمانەکیان بێزار دەبین.

پێیان وت: بۆ ئێمەی ڕون بکەرەوە ئایا دیاری کردنی داوەر سەبارەت بەخوێنی موسوڵمانان ڕەوایە یا نە؟

فەرموی: ئێمە پیاوەکانمان نەکردە داوەر، بەڵکو قورئان داوەرمانە. قورئان خۆی نوسراوێکە لەناو دوپێست، قسە ناکات مەگەر ئەوەی پیاوان بیهێنینە سەر زمان.

وتیان: بۆ ئێمەی ڕون بکەرەوە چ دەسپێکێکت لەنێوان خۆت و ئەم خەڵکە دەستنیشان کردوە؟

عەلی فەرموی: تا نەزان بەئاگا بێتەوە و زانا، زانایەکەی زیاتر ببێت. ئەگەری هەیە خوا لەماوەی ڕۆژگاری ئاگربڕ، کاری ئەم خەڵکە بەرەو چاکبون ببات، خوا لێتان خۆش بێت، بگەڕێنەوە بۆ ناو شار.

خەواریج، هەمویان تا دوایین کەس ڕۆشتنە ناو شار.

دەستەیەك دەڵێن: خەواریج گومان دەکەن ئەوان پێیان وت: تۆ ڕاستت کرد، ئێمە بەو شێوە بوین کەئاماژەت پێدا و ئەمە ناباوەڕی بو، ئێمە بۆ لای خوا دەگەڕێینەوە، تۆیش تۆبە بکە تا بەیعەت لەگەڵ تۆ بکەین و گەر نە لەگەڵ ناسازگاری خۆمان بەردەوام دەبین. خەواریج دەڵێن: عەلی لەگەڵ ئێمە بەیعەتی کرد و وتی: بگەڕێنەوە بۆ ناو شار تا شەش مانگ تێپەڕ بکات و ئێمە باج و خێرات کۆبکەینەوە و مەڕوماڵات قەڵەو ببن و دواتر بۆ شەڕی دوژمن دەڕۆینەدەر.

خەواریج درۆیان کردوە چونکە عەلی هیچ دانەواندنێکی لەبەرابەر ئەوان نەکرد و هیچ پەیمانێکی بەوان نەداوە.

## کۆبونەوەی دو داوەرەکە

کاتێك زەمانی کۆبونەوەی دو داوەرەکە گەیشت، عەلی چوارسەد پیاوی بەفەرماندەیی شورەیح کوڕی هانی حارسی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا بەعەمرۆعاص بڵێت: عەلی بەتۆ دەڵێت: گەورەترین کەس لای خوای گەورە و ڕێزدار کەسێکە کردار لەسەر بنەمای ڕاستی و دروستی، لەهەرکارێك لای ئەو خۆشەویستتر بێت. ئەی عەمرۆ، تۆ پێگەی ڕاستی و دروستی دەزانیت، بۆ خۆت نەزان دەکەیت؟ ئەگەر تەماحێکی کەمیان خستۆتە بەردەم تۆ، بەم کارە تۆیان کردوە بەدوژمنی خواوەند و

هاورێکانی. دەبینم، ئەوەی بەتۆیان داوە، بەزویی لەناو دەچێت. هاوار لەتۆ، هاورێی خیانەتکاران و پشتیوانی ستەمکاران مەبە. ئاگادار بە من لەئێستاوە رۆژی پەشیمانی تۆ دەزانم و ئەمە رۆژی مەرگی تۆیە کەئارەزو دەکەیت خۆزگە رِقی هیچ موسوڵمانێکت لەدڵ نەدەگرت و بۆ هیچ داوەریەك بەرتیلت وەرنەدەگرت.

کاتێك پەیامەکەی پێگەیشت، روخساری گۆڕا و وتی: لەچ کاتێکەوە گرنگیم بەبۆچونی ئەو داوە؟

شورەیح وتی: ئەی کوڕی نابغە، چ شتێك رێگرە لەبەردەم تۆ کە بەراوێژ کردنی سەروەری خۆت و هەمو موسوڵمانان رازی ببیت؟ ئەو کەسانەی لەتۆ باشتر بون وەك ئەبوبەکر و عومەر، لەگەڵ ئەو راوێژیان دەکرد و فەرمانی ئەویان بەکار دەبرد.

عەمرۆ عاص وتی: کەسێکی وەك من لەگەڵ کەسێکی وەك تۆ قسە ناکات.

شورەیح وتی: ئەی کوڕی نابغە، بەکام یەك لەمناڵەکانت شانازی بەسەر منەوە دەکەیت؟ لەگەڵ باوکی ریسوات یا دایکی روسپیت؟ شورەیح هەستا.

عەلی، عەبدالله کوڕی عەباسی رەوانە کرد تا پێشنوێژی ئەوان بێت و کاروبارەکانی ئەوان هەڵسوڕێنێت.

معاویە عەمرۆعاصی لەگەڵ چوارسەد کەس لەخەڵکانی شام رەوانە کرد تا گەیشتنە دومەت ئەلجەندەل و لەوێوە بۆ ئەزرەح. هەرکاتێك نامەی معاویە بۆ عەمرۆ عاص دەگەیشت، نەکەس دەیزانی چی تیا نوسراوە و نە شامیەکان دەیانپرسی. بەڵام کاتێك نامەی عەلی دەگەیشت، عێراقیەکان لەعەبدالله کوڕی عەباس پرسیاریان دەکرد و ئەگەر ناوەرۆکەکەی دەشاردەوە، گومانیان لێدەکرد و دەیانوت: ئایا فلان شت و فیسارە شتی نەنوسیوە؟

کوڕی عەباس بەوانی وت: ئایا ئاوزی خۆتان ناخەنە کار؟ نابینن نێردراوی معاویە دێت و کەس لەپەیامەکەی ئەو ئاگادار نابێتەوە و دەنگیان لێ بەرز نابێتەوە. ئێوە هەر رۆژ گومانێکی تازەتان لا دروست دەبێت.

لەگەڵ ئەوان عەبدالله کوڕی عومەر و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکری صدیق و عەبدالله کوڕی زوبەیر و عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هشام و عەبدولرەحمان کوڕی عەبدیەغوسی زوهری و ئەبو جەهم کوڕی حوزەیفەی عەدەوی و موغەیرە

کوڕی شەعبە هاتن.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاص لەبیابان لەسەر ئاوێکی بەنی سولەیم بو. کوڕەکەی عومەر کوڕی سەعد هاتە لای و پێی وت: ئەبوموسای ئەشعەری و عەمرۆ عاص هاوڕێ لەگەڵ کەسانێك لەقوڕەیش کۆبونەتەوە. لای ئەوانە ئامادە بە چونکە یەکێکی لەهاوەڵانی پێغەمبەر ویەکێك لەوشەش پیاوەیت کەعومەر ئەوی بۆ راوێژ کردن و دەستنشیان کردنی خەلیفە دیاری کرد، هیچ کارێکت نەکردوە ئەم خەڵکە پەسەندی نەکەن، تۆ شیاوترین کەس بۆ خەلافەتی. سەعد نەڕۆشت. دەستەیەك دەڵێن: ئامادە بو بەلاَم لەئامادەبونی خۆی پەشیمان بویەوە و لەبەیت ئەلموقەدەس جل و بەرگی عەمرەی لەبەر کرد.

موغەیرە کوڕی شەعبە بەپیاوانێك لەقوڕەیشی وت: ئایا گومان دەکەن کەسێك بتوانێت بۆچونێکی هەبێت تا لەرێگەیەوە بزانێت ئایا دو داوەرەکە لەسەر کارێك رێك دەکەون یا نە؟

وتیان: نە.

وتی: من دەتوانم بزانم چارەنوسی کۆبونەوەی دو داوەرەکە بەکوێ دەگات. ئەو هاتە لای عەمرۆعاص وپێی وت: ئێمە لەو کارەی بۆ ئێوە ئاشکرا بو، گومانمان لا دروست بوە، کاری ئێمە کە لەشەڕ خۆمان بەدور گرتوە، چۆن دەبینی.

عەمرۆعاص وتی: ئێوە لەپشت سەری چاکەکاران و لەپێش خراپکارانەوە دەبینم.

موغەیرە لای ئەو ڕۆشتەدەر و ڕۆشتە لای ئەبوموسا و هەمان قسەی پێ وت.

ئەبو موسا وەلاَمی دایەوە: ئێوە وەك بەهێزترینی کەسەکان لەبەکار بردنی ئاوزی خۆتان دەبینم و گومان دەکەم تروسکایی کەمی هیوایی خەڵك بەئێوەیە.

موغەیرە بۆ لای هاورێکانی گەڕایەوە و بەوانی وت: هیچ کات ئەم دوانە لەسەر کارێك رێکناکەون.

کاتێك دو داوەرەکە لەگەڵ یەك کۆبونەوە، عەمرۆعاص وتی: ئەی ئەبوموسا ئایا نازانی عوسمان بەستەم کوژرا؟

ئەبوموسا وتی: شایەتی دەدەم.

عەمرۆ وتی: ئایا نازانی معاویە و بنەماڵەکەی ئەو، خاوەنی خوێنی ئەون؟

ئەبو موسا وتی: دەزانم.

عەمرۆ وتی: ئەگەر دەزانیت چ شتێك رێگری لەتۆ دەكات بۆ فەرمانبردن لەو و بنەماڵەكەی لەناو قورەیش؟ ئەگەر دەترسی خەڵك بڵێن: ئەو پێشینەی نیە، بڵێ: ئەو بەخاوەنی خوێنی خەلیفەی ستەم لێكراو دەزانم و دەزانم داوای خوێنی ئەو دەكات و بۆ بەرێوبردنی وڵات كەسێكی وشیار و بیرمەندە، برای دایكی حەبیبە هاوسەری پێغەمبەری خوایە و دەبیری ئەوە، لەهاوەڵانی پێغەمبەر هەژمار دەكرێت و پێغەمبەر دەستی ئەوی بۆ سەر كارەكان ئاوەڵا كردوە. عەمرۆ عاص بەشێوەیەكی نهێنی بەئەبوموسای وت، ئەگەر معاویە بێنیتە سەركار، بەشێك لەفەرمانرەوایی بەتۆ دەسپێرین.

ئەبوموسا وتی: ئەی عەمرۆ لەخوا بترسە! ئەوەی سەبارەت بەگەورەیی بنەماڵەی معاویە وتت، دەبێت بزانیت فەرمانرەوایی كردنی موسوڵمانانیان لەسەر بنەمایی گەورەیی بنەماڵە لەدەست نەگرت. ئەگەر ئەم كارە لەسەر بنەمایی گەورەیی بنەماڵە دەسورا، بنەماڵەی ئەبرەهە كوڕی صەباح شیاوتر بون. كاری فەرمانرەوایی موسوڵمانان لەسەر بنەمایی دینداری و رێزاری داری ئەوان بەهێزە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر دەمویست ئەم كارە بەگەورەكانی قورەیش بسپێرم، بەعەلی كوڕی ئەبی تالیم دەسپارد. بەڵام ئەوەی وتت: معاویە، خاوەنی خوێنی عوسمانە و لەبەر ئەمە خەلافەت بەو دەسپێریت، بزانە هیچ كات بەوە رازی نابم و یەكەم كۆچكەرانی رێگەی خوا پشت گوێ ناخەم. بەڵام سەبارەت بەوتارە نهێنیەكەت كە ئەگەر معاویە بێنمە سەر كار، بەشێك لەفەرمانرەوایی بەمن دەسپێرن، من ئەو كەسە نیم سەبارەت بەفەرمانی خوا بەرتیل لەكەس وەربگرم! بەڵام ئەگەر بتەوێت دەتوانین ناوی عومەر كوڕی خەتاب زیندو بكەینەوە.

عەمرۆعاص پێی وت: تۆ چاكەكاری ولەپێشی كوڕەكەی من دەزانیت، چ شتێك رێگر دەبێت لەرازی بون بەفەرمانرەوایی ئەو؟

ئەبوموسا وتی: كوڕەكەی تۆ كەسێكی راست و دروست بو، بەڵام تۆ لەم ئاژاوەدا نوقمت كرد.

عەمرۆ وتی: ئەم كارە سزای كەسێكە بخوات و بخواتەوە ( كوڕی عومەر پیاوێكی

کەم هۆش و ئاناگا بو)

کوڕی زوبەیر پێی وت: وشیار وبەئاگا بە!

ئەبو موسا پێی وت: ئەی کوڕی عاص، عەرەبەکان دوای ئەوەی رۆژگارێك شمشێریان لەیەك دا، کاری خۆیان بەتۆ سپارد، ئەوان مەخەرە گێژاوی ئاژاوەوە.

عەمرۆعاص کارێکی کرد ئەبوموسا لەقسە کردندا پێشی بکەوێت. بەردەوام پێی دەوت: تۆ هاوەڵ و هاورێی پێغەمبەر و لەمن بەتەمەنتریت، تۆ قسە بکە. ئەبوموسایش عادەتی بەمە گرتبو و ئەم کارەی لای خۆش بو. مەبەستی عەمرۆعاص لەم کارە ئەوەبو تا بۆ لەسەر کار لابردنی عەلی پێش خۆی بخات. کاتێك گەشتنە ئەو جێگەی عەمرۆ داوای رازی بونی ئەبوموسای دەکرد بۆ کوڕەکەی خۆی یا معاویە و ئەبو موسا رازی نەدەبو و داوای رازی بونی دەکرد بۆ کوڕەکەی عومەر و عەمرۆ رازی نەبو، عەمرۆ عاص پێی وت: لەبۆچونەکەی خۆت ئاگادارم بکەرەوە؟

ئەبوموسا وتی: بۆچونم وایە ئەم دوپیاوە لەسەر کار لابەرین و کار بەراوێژ بسپێرین تا موسوڵمانان هەر کەسێکیان پەسەند کرد وەك خەلیفە دەستنیشانی بکەن.

عەمرۆ وتی: بۆچونی راست ئەوەیە.

ئەم دوانە رویان کردە خەڵك کە لەو کۆبونەوەدا بەشدار بون.

عەمرۆ وتی: خەڵك ئاگادار بکە کەئێمە رێککەوتین.

ئەبو موسا کەوتە قسە و وتی: بۆچونی ئێمە لەسەر کارێك رێککەوت وئارامی گرت و هیواداریین خوا بەم کارە، کاری ئەم ئۆمەتە بەرەو باشبون ببات.

عەمرۆ وتی: راستی وت. ئەی ئەبوموسا پێش کەو و قسە بکە.

ئەبو موسا کەوتە پێش.

کوڕی عەباس پێی وت: هاوار لەتۆ، سوێند بەخوا گومان دەکەم ئەو تۆی فریوداوە. ئەگەر لەسەر کارێك رێککەوتن با ئەو لەپێش تۆ قسە بکات و تۆ دوای ئەو چونکە ئەو پیاوێکی فێڵباز و دەغەڵکارە. من لەوە ئاسودە نیم بەنهێنی تۆی رازی کردبێت بەڵام کاتێك لەناو خەڵك زمان بۆ وتارە بکاتەوە، لەگەڵ تۆدا ناسازگار بێت.

ئەبو موسا پیاوێکی نەزان بو. وتی: ئێمە رێککەوتوین. دوبارە وتی: ئەی خەڵکینە، ئێمە لەکاری ئەم ئۆمەتە وردبوینەوە و کارێکی شیاوترمان نەبینی بۆ چارەنوسی ئەم

خەڵکە و کۆکردنەوەیان لەوەی من و عەمرۆ لەسەری رێك کەوتین. بۆچونی ئێمە ئەومیە عەلی و معاویە لەسەر کار لاببەین تا خەڵك خۆیان سەرپشتەی کارەکانیان بگرنەدەست. من عەلی و معاویەم لەسەر کار لابرد، روبکەنە کارەکانی خۆتان و ئەو کەسەی دەتانەوێت وەك خەلیفەی خۆتان دەستنیشانی بکەن. دواتر ئەبو موسا رۆشتە دواوە.

عەمرۆعاص هاتە پێش و دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: ئەم پیاوە شتێکی وت و بیستتان، ئەو سەرەوەری خۆی لەسەر کار لابرد، منیش سەرەوەری ئەو لەسەر کار لادەبەم و سەرومری خۆم لەسەر کارەکەی دەهێڵمەوە چونکە ئەو خاوەنی خوێنی عوسمانە و شیاوترینی خەڵکە بۆ پێگەکەی.

سەعد وتی: چەندە پیاوێکی سست و ریسوایت، ئەی ئەبو موسا! چەندە بەسانایی کەوتیتە ناو داوەکانی عەمرۆعاص.

ئەبوموسا وتی: چی بکەم؟ لەسەرەتاوە لەسەر کارێك لەگەڵ من رێکەوت و دواتر شانی لەژێر خاڵی کرد.

کوڕی عەباس وتی: ئەی ئەبو موسا تۆ گوناحت نیە، گوناح لەگەردنی ئەو کەسانەدایە کەسێکی لاوازی وەك تۆیان بۆ ئەم کارە دەستنیشان کرد.

ئەبو موسا وتی: خیانەتی کرد، ئێستا دەبێت چی بکەم.

کوڕی عومەر وتی: بڕوانن کاری ئەم خەڵکە گەشتۆتە کوێ! چارەنوسەکەی لەلایەك کەوتۆتە دەست پیاوێك کەنازانێت چی دەکات و لەلایەکی دیکە کەوتۆتە دەست پیاوێك کە بەتەواوی لاواز و سستە.

عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر وتی: ئەگەر ئەبوموسا پێش ئەمە مردبو، بۆ خۆی باشتر بو.

ئەبوموسا بەعەمرۆی وت: خوا بەختەوەرت نەکات، خراپەت کرد و فێڵت! داستانی تۆ لەداستانی ئەو سەگە دەچێت ئەگەر هێرشی بکەیتەسەر، زمان لەدەم دەردێنێت و ئەگەر بەرەڵای بکەیت، زمان لەدەمی فرێدەداتەدەر (اعراف/٧/١٦٧).

عەمرۆ وتی: تۆیش بەهەمان شێوەی کەوتویانە: چوارپێیەك و چەند کتێبێکی لەسەر (جمعه/٦٢/٥).

شورەیح کوڕی هانی هێرشی کردە سەر عەمرۆ عاص و بەقامچی لێیدا و یەکێك لەکوڕەکانی عەمرۆعاص هێرشی کردە سەر ئەبوموسا و لێیدا. خەڵك جیایان کردنەوە. دواتر شورەیح بەردەوام دەیوت: هیچ کات تا ئەو ئەندازە پەشیمان نەبومەوە بۆچی بەشمشێر عەمرۆعاصم نەکوشت.

خەڵکانی شام بەدوای ئەبوموسادا گەڕان و ئەو بۆ مەککە هەڵات. دواتر عەمرۆ عاص و خەڵکی شام بۆ لای معاویە گەڕانەوە و وەك خەلیفە سلاّویان لێکرد. کوڕی عەباس وشورەیح بۆ لای عەلی گەڕانەوە. لەوە بەدوا کاتێك عەلی نوێژی بەیانی دەخوێند، لەکاتی پاڕانەوەدا دەیوت: ئەی خوایە، معاویە و عەمرۆعاص و ئەبونەعوەر و حەبیب و عەبدولرەحمان کوڕی خالد و زوحاك کوڕی قەیس و وەلید نفرین بکە. هەواڵی ئەم کارە بەمعاویە گەیشت. ئەویش لەدۆعاکانی خۆی جوێنی بەعەلی و حەسەن و حسێن و ئەشتەری نەخەعی دەدا.

دەستەیەك دەڵێن: معاویە لەکۆبونەوەی دوداوەرەکە ئامادە بو و لەکاتی ئێواردا قسەی بۆ خەڵك کرد و وتی: هەرکەس دەیەوێت سەبارەت بەم کارە قسە بکات، شاخی خۆیمان نیشان بدات.

کوڕی عومەر دەڵێت: لەشوێنەکەی خۆم هەستام و ویستم بڵێم: کەسانێك سەبارەت بەم کارە قسە دەکەن لەگەڵ تۆ جەنگیان کرد ولەگەڵ باوکت شەڕ تا باوەڕتان بەئیسلام هێنا. ترسام قسەیەکم کردبێت ببێتە هۆی ڕژانی خوێن و ئاژاوە لەناو خەڵك. ئەوبەهەشتەی خوا مژدەی پێدابو، لای من خۆشەویستتر بو. کاتێك بۆماڵەوە گەڕامەوە، حەبیب کوڕی موسلیمە هاتە لای من و وتی: چ شتێك ڕێگر بو لەوەی لەبەرابەر ئەم پیاوە قسە نەکەیت؟.

وتی: ویستم قسە بکەم بەلاّم ترسام.

حەبیب وتی: بەختەوەر و ڕێزدار بویت.

ئەمە ڕاستە چونکە گێڕانەوەی ڕاست بەمشێوەیە.

## بەسەرهاتی خەواریج لەکاتی ڕەوانە کردنی داوەران

## ئامادە کردنی بارودۆخ بۆ شەڕی نەهرەوان

کاتێك عەلی ئاهەنگی ئەوەی کرد ئەبوموسا بۆ داوەری ڕەوانە بکات، دو پیاو لەخەواریج بەناوەکانی زەرعە کوڕی بورجی تایی و حورقوص کوڕی زوهەیری سەعدی هاتنە لای و وتیان: داوەری کردن تەنیا بۆ خوا شیاوە!

عەلی وتی: داوەری تایبەتە بەخوا.

حورقوص کوڕی زوهەیر وتی: لەگوناح بگەڕێرەوە و داوەری هەڵبوەشێنە و ئێمە بۆ شەڕی دوژمن ببە تا لەڕێگای خوادا بکوژرێین.

عەلی وتی: ئەو ڕۆژەی قوڕئانەکانیان کرد بەڕمەکانەوە، داوام لەئێوە کرد درێژە بەشەڕ بدەن بەڵام نافەرمانی منتان کرد. ئێمە لەنێوان خۆمان و خەڵك پەیمانمان نوسیوە و مەرج و بەڵێنمان بەستوە و خوای گەورە فەرمویەتی: کاتێك لەگەڵ خوا پەیمان دەبەستن، ڕێزی لێ بگرن (نحل/١٦/٩١)

حورقوص وتی: ئەوە گوناحێکە و دەبێت بۆ خوا بگەڕێیتەوە.

عەلی وتی: گوناح نەبو، ناتەوانی ئێوە لەبەکار بردنی ئاوز بو.

زەرعە وتی: ئەی عەلی، ئەگەر لەداوەری دەست هەڵنەگریت، بێ گومان لەگەڵ تۆ شەڕ دەکەم و لەم کارەدا بەدوای ڕەزامەندی خوادا دەگەڕێم.

عەلی وتی: هاوار لەتۆ چەندە بەدبەختی! بەڕونی دەبینم تۆیان کوشتوە و بای گۆڕەپان لەسەر تۆ هەڵدەکات.

وتی : حەزدەکەم ئەم کارە روبدات. ئەوان لای ئەو ڕۆشتنەدەر و بەردەوام دەیانوت: داوەری تەنیا بۆ خوا شیاوە.

ڕۆژێك عەلی وتاریدا و خەواریج لەم لاولای مزگەوت هاواریان کرد: داوەری تەنیا بۆ خوا شیاوە!

عەلی وتی: خوا گەورەیە! قسەیەکی ڕاست و دروستە، ئەگەر بێدەنگ بن، وەك خۆمانن و ئەگەر قسە بکەن، بەڵگەیان بۆ دەهێنینەوە و ئەگەر شەڕمان لەگەڵ بکەن،

کوشتاریان دەکەین.

یەزید کوڕی عاصمی محاربی لەشوێنەکەی هەستا و وتی: سوپاس بۆ خوا، پەروەردگار پشت گوێ ناخەین! ئەی خوایە پەنا بۆ تۆ دەبەین ئەگەر لەکاری دین لاوازی لەخۆمان نیشان بدەین چونکە لاوازی لەکاری دین لاوازی لەکاری خوایە و ریسواییێکە تورەیی خوای بەدواوە دێت. ئەی عەلی، ئایا ئێمە لەکوشتن دەترسێنیت؟ سوێند بەخوا هیوادارم بەزویی بەشمشێر بتانکوژین و ئەوسا بزانین کێ شیاوترە بڕواتە ناو ئاگری جەهەننەم.

ئەو و سێ براکەی لەگەڵ خەواریج ڕۆشتنە نەهرەوان و کوژران و یەکیان دوای ئەوە لەنوخەیلە کوژرا.

دواتر رۆژێکی دیگە عەلی وتاریدا و پیاوێك هەستا و وتی: داوەری کردن تەنیا بۆ خوا شیاوە! دواتر دەستەیەك لەخەڵکان هەستان وئەم قسەیان هێنایە سەر زمان. عەلی وتی: خوا گەورەیە! قسەیەکی راست و دروستە و بەدوای چەوتی و لاریدا دەگەڕێن. بزانن تا لەگەڵ ئێمەن سێ شت لەئێوە دریغ ناکەین: رێگریتان ناکەین بۆ ڕۆشتنە ناو مزگەوتەکانی خوا، بەخشینەکانمان بەئێوە دەبەخشین و ئەمە تا کاتێکە دەستتان لەناو دەستی ئێمەدایە، لەگەڵ ئێوەدا شەڕ ناکەین مەگەر ئەوەی ئێوە شەڕ دەست پێبکەن. فەرمانی خوا لەبارەی ئێوە بەکار دەبەین. دواتر عەلی درێژەی بەوتارەکەی خۆیدا.

خەواریج چاویان بەیەك کەوت و لەماڵی عەبداللە کوڕی وەهبی راسبی کۆبونەوە. ئەوبۆ ئەوان قسەی کرد و داوای لێکردن دڵدان بەم دنیایە کەم بکەنەوە، خۆیان لەم دنیا رزگار بکەن، داوای چاکە لەخەڵك بکەن و لەخراپە رێگریان لێ بکەن. دواتر وتی: با لەم شارە کەخەڵکەکەی ستەمکارن بڕۆینەدەر و بۆ دیهاتی کوێستانەکان پەنا ببەین و یا بڕۆینە شارێکی دیکە و سەرکۆنەی ئەم گومڕاکەرانە بکەین.

حورقوص کوڕی زوهەیر وتی: کاڵای ئەم دنیایە کەم و کەم بەهایە و جیابونەوە لێی نزیك. ئاگادار بن زێر و شکۆی ئەم جیهانە بۆ مانەوە هانتان نەدات و نەبێتە رێگر لەگەڕان بەدوای راستی و دروستی و رزگاری. خواوەند لەگەڵ چاکەکاران و خۆپارێزانە (نحل/١٦/١٢٨)

حەمزە کوڕی سەنانی ئەسەدی وتی: ئەی خەڵکینە بۆچونی ڕاست ئەوەیە ئاماژەتان پێدا. سەروەری بەپیاوێك لەخۆتان بدەن چونکە بەناچاری ستون و کۆڵەکەیێك و پشتیوانێکتان دەوێت تا لەدەوری بسوڕێنەوە و پشتی پێ ببەستن.

سەرکردایەتیان بۆ زەید کوڕی حوصەینی تایی پێشنیار کرد و ڕازی نەبو. بەحورقوص کوڕی زوهەیریان پێشنیار کرد و ڕازی نەبو. بەحەمزە کوڕی سەنان و شورەیح کوڕی ئەوفی عەبەسیان پێشنیار کرد و ڕازی نەبون. بەعەبدالله کوڕی وەهبیان پێشنیار کرد. وتی: ڕازیم، نە لەبەر خۆشی ئەم دنیا پێی ڕازی دەبم و نە لەترسی مەرگ وازی لێ دێنم. ئەوان لەدەی شەوال /٢١ مارسی/٦٥٨ بەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەویان بە (ذوثفنات) ناو دەبرد.

دواتر لەماڵی شورەیح کوڕی ئەوفی عەبەس کۆبونەوە. کوڕی وەهب وتی: ئێمە ببەن بۆشارێك تا بۆ سەقامگیر کردنی فەرمانی خوا لەوێ کۆ ببینەوە چونکە ئێوە خاوەندانی ڕاستی و دروستین.

شورەیح وتی: دەڕۆینە مەداین و لەوێ دادەبەزین و هێرش دەکەینە سەر دەروازەکان و دەیگرین و دانیشتوانەکەی دەردەکەین وکەس بۆ لای براکانمان لەبەسرە ڕەوانە دەکەین تا لەدەوری ئێمە کۆببنەوە.

زەید کوڕی حوصەین وتی: ئەگەر پێکەوە بڕۆنەدەر، شوێنتان دەکەون، یەك یەك و بارسوك بەرێکەون. لەمەداین کەسانێك هەن ڕێگر بن لەئێوە. بەرێکەون تا لەپردی نەهرەوان دابەزن. نامە بۆ براکانتان لەبەسرە بنێرن و بانگیان بکەن. وتیان: بۆچونی ڕاست ئەوەیە.

عەبدالله کوڕی وەهب بۆخەواریجی بەسرە نامەی نوسی و ئاگاداری کردنەوە کە لەسەر چ کارێك ڕێککەوتون. داوای لێکردن پەیوەستیان ببن. ئەوان ڕازی بون.

کاتێك ئاهەنگی بەرێکەوتنیان کرد، شەویان بەپاڕانەوە لەخوا بەسەر برد، شەو و ڕۆژی هەینی بو. ڕۆژی شەممە بەرێکەوتن. شورەیح کوڕی ئەوفی عەبەسی هاتەدەر و ئەم وتارەی خوای گەورەی خوێندەوە: موسا لەو شارە ڕۆشتەدەر و ترساو وچاوەڕوان بو و بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە، من لەستەمکاران ڕزگار بکە. کاتێك ڕوی کردە مەداین وتی: هیوادارم خوا من بۆ ڕێگەی دروست ڕێنوێنی بکات (قصص/٢٨/٢١—

٢٢). هاورێ لەگەڵ ئەوان تەرفە کوڕی عودەی کوڕی حاتەم هاتەدەر. باوکی شوێنی کەوت بەڵام نەیتوانی بیگەڕێنێتەوە. ئەو ڕۆشتە مەداین و گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە سابات، عەبداللە کوڕی وەهبی راسبی بەبیست پیاو روبەروی بویەوە. عەبداللە ئاهەنگی ئەوەی کرد بیکوژێت بەڵام عەمرۆ کوڕی مالکی نەبهانی و بێشر کوڕی زەیدی بەوەلانی رێگریان لێکرد. عودەی کەسی بۆ لای سەعد کوڕی مەسعود فەرمانداری عەلی لەمەداین رەوانە کرد و لەهاتنی خەواریج ئاگاداری کردەوە. ئەو دەروازەکانی مەداینی گرت و لەگەڵ سوارەکان ڕۆشتنەدەر و برازاکەی خۆی یانی موختار کوڕی ئەبو عوبەیدی وەك جێگری خۆی لەشارەکە دەست نیشان کرد و بەشوێن ئەواندا گەڕا. هەواڵی ئەم کارە بەعەبداللە کوڕی وەهب گەیشت. بەوردبینیەوە بەرێگاکەی خۆیدا ڕۆشت و لای بەغداد تێپەڕی کرد. سەعد کوڕی مەسعود لەگەڵ پێنسەد سوار لەکاتی شەودا بەوان گەیشت. ماوەیەك شەڕیان کردو سەرئەنجام خواریج خۆیان بەدور گرت و دەستیان بەبەرگری لەخۆیان کرد.

هاوەڵانی سەعد کوڕی مەسعود پێیان وت: هێشتا فەرمان بەتۆ نەگەیشتوە، لەشەڕ کردن دژی ئەم خەڵکە چیت دەوێت؟ رێگە بدە ئەوان گوزەر بکەن و نامەیەك بۆ سەروەری باوەڕداران بنوسە و ئەگەر فەرمانی ئەو بۆ گرتنی ئەوان گەیشت، شوێنیان بکەوە و ئەگەر کەسێکی دیکە بۆ سەرکەوتی ئەوان دەستنیشان بکات و ئەم کارە لەسەر شانی تۆ هەڵگرێت، ئەمە هۆکاری رزگار بون و ئاسودەیی تۆیە. سەعد بەم پێشنیارە رازی نەبو. کاتێك شەو داهات، عەبداللە کوڕی وەهب ڕۆشتەدەر و لەدیجلەوە بەرەو سەرزەمینی جوخی تێپەڕی کرد و بەرەو نەهرەوان ڕۆیشت و خۆی بەهاوەڵانی گەیاند و بینی لەهاتنی ئەو بێ هیوا بون. وتیان: ئەگەر عەبداللە لەناو دەچو، زەید کوڕی حوصەین یا حورقوص کوڕی زوهەیرمان دەکردە سەرکردەی خۆمان.

دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە ڕۆشتنەدەر تا پەیوەستی خەواریج ببن. کەسەکانیان رێگەی ئەم کارەیان لێگرتن. ئەم کەسانە لەناویاندا بون: قەعقاع کوڕی قەیسی تایی مامی تێرماح کوڕی حەکیم و عەبداللە کوڕی حەکیم و عەبدولرەحمانی بەکایی. هەواڵ بەعەلی گەیشت سالم کوڕی رەبیعەی عەبەسی دەیەوێت بڕواتەدەر. ئەوی بانگ کرد و ئامۆژگاری کرد. سالم بەکوڕەکانی رازی بو.

کاتێك خەواریج لەکوفە ڕۆشتنەدەر، یاران و هاوەڵانی عەلی ڕۆشتنە لای و بەیعەتیان لەگەڵ بەست و وتیان: ئەو کەسەمان خۆش دەوێت تۆ خۆشت بوێت و دوژمنی ئەو کەسەین تۆ بەدوژمنی بزانیت.ئەو لەم پەیمانەدا شێوازی پێغەمبەری بەکار برد.

ڕەبیعە کوڕی ئەبی شەدادی خەسعەمی ڕۆشتە لای ئەو کە لەشەڕی وشتر و صەفین بەشداری کردبو و ئاڵای خەڵکی حەسعەمی لەدەستا بو. عەلی وتی: بەیعەت بکە لەسەر بنەمایی نوسراوی خوا و شێوازی پێغەمبەر.

ڕەبیعە وتی: لەسەر شێوازی ئەبوبەکر و عومەر.

عەلی پێی وت: هاوار لەتۆ! ئەگر ئەبوبەکر و عومەر لەسەر نوسراوی خوا کاریان نەدەکرد، کەمترین مایە لەراستی و دروستیان پێدەبڕا. ئەو لەگەڵ عەلی بەیعەتی کرد. عەلی سەیری کرد و وتی: سوێند بەخوا دەبینم لەگەڵ خەواریج دەڕۆیتەدەر و دەکوژرێیت و لەژێر سمی چوارپێکان پێشێل دەکرێیت. ئەو لەشەڕی نەهرەوان لەگەڵ خەواریج کوژرا.

خەواریجی بەسرە لەدەستەیەکی پێکهاتو لەپێنسەد کەس کۆبونەوە و مێسعەر کوڕی فەدەکی تەمیمیان کردە سەرکردەی خۆیان. کوڕی عەباس لەکارەکەیان ئاگادار بویەوە و ئەبوئەلاسوەدی دوئێلی بەشوێن ئەواندا رەوانە کرد. ئەو لە پردی (مەهین) بەوان گەیشت. لەبەرابەر یەك ریزیان بەست تا شەو جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد. مێسعەر لەتاریکی شەو خەڵکی هەلگرت. فەرماندەی پێشەنگەکانی ئەشرەس کوڕی ئەوسی شەیبانی بو. بەرێکەوت و خۆی لەنەهرەوان بەعەبدالله کوڕی وەهب گەیاند.

کاتێك خەواریج ڕۆشتنەدەر و ئەبوموسا ئەشعەری بۆ مەککە هەلأت و عەلی عەبدالله کوڕی عەباسی بۆ بەسرە گەڕاندەوە، لەکوفە وتارێکیدا و وتی: سوپاس بۆ خوا ئەگەر ڕۆژگاری پیشهاتێکی مەترسیدار و روداوێکی بەئازار داباڕێنێت. شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوا نیە و محەممەد نێردراوی ئەوە. دوای سلأو، نافەرمانی هۆکاری داخ و پەشیمانیە. من سەبارەت بەم دو پیاوە و داوەری هەمو شتێکم بەئێوە وت و بۆچونی خۆم لەگەڵ ئێوەدا باس کرد. (خۆزگە فەرمانیان لەقەیسەر دەبرد) بەڵام ئێوە تەنیا مەبەستەکانی خۆتان بەکار برد و من و ئێوە بەو شێوەین کەشاعیری

هوازين وتويەتی:

امر تهم امری بمنعرج اللوی فلم يستبينوا الرشد الاضحی الغد

یانی: فەرمانی خۆم لە (مێنعەرجی ئەللوی) بەوان گەیاند. بەلأم ئەوان تا نیمەڕۆی بەیانی (کە کار لەکار ترازا) ئاگادار نەبونەوە.

ئاگادار بن ئەم دوپیاوەی وەك داوەر هەڵتانبژارد، فەرمانی قورئانیان پشت گوێ خست و ئەوەی قورئان مراندبوی، زیندویان کردەوە و هەرکامیان بەدوای مەبەستەکانی خۆیاندا ڕۆشتن بێ ئەوەی ڕێنوێنی خوای لەسەر بێت. فەرمانێکی بێ بەڵگە و پوچیان پایەدار کرد و لەفەرماندان لەگەڵ یەك بەناسازگاری گەیشتن و هیچ کام ڕێگەیان بۆ هیچ شوێنێك نەبرد. دواتر خواوەند و پێغەمبەر و باوەڕدارە شیاوەکان لەوان بێزار بون. بۆ شەڕ ئامادە بن و خۆتان کۆبکەنەوە و دەمانەوێت بەرەو شام بڕۆین. بەرەبەیانی ڕۆژی دوشەممە بەخواستی خوا، لەلەشکرگەی خۆتاندا بن.

دواتر لەسەر تەختی وتاردان هاتە خوار و بۆ خەواریج نامەی نوسی: بەناوی خواوەندی بەخشندە و مێهرەبان. لەبەندەی خوا عەلی سەروەری باوەڕداران بۆ زەید کوڕی حوصەین و عەبدالله کوڕی وەهب و هاوڕێکانی ئەوان لەخەڵکان. دوای سڵاو، ئەو دوپیاوەی وەك داوەر هەڵمانبژاردن، لەگەڵ نوسراوی خوا ناسازگاریان کرد و بەدوای مەبەستەکانی خۆیاندا ڕۆیشتن بێ ئەوەی ڕێنوێنی خوای لەسەر بێت. نە لەسەر شێوازی پێغەمبەر جولأنەوە و نەفەرمانی قورئانیان بەکار بەست. لەبەر ئەمە، خواوەند و پێغەمبەر و باوەڕداران لەوان بێزار بون. کاتێك نامەکەی من بەئێوە بگات، بگەڕێنەوە چونکە ئاهەنگی شەڕ لەگەڵ دوژمنی ئێوە و دوژمنی خۆمانمان هەیە و لەسەر پەیمانەکەی پێشوی خۆمانین.

خەواریج بۆیان نوسی: دوای سڵاو، تۆ بۆ خوا شەڕ ناکەیت بەڵکو بۆ خۆت. ئەگەر شایەتی بۆ خۆت دەدەیت کەناباوەڕیت و ئەگەر بۆ خوا بگەڕێیتەوە، لێکۆڵینەوە دەکەین تا بزانین لەنێوان ئێمەدا چی ڕودەدات و گەرنە، ئاگاداری پێویستمان دا و خوا فریوکارانی خۆش ناوێت.

کاتێك نامەکەی ئەوانی خوێندەوە، لەوان هیوابڕاو بو و بەباشی زانی گرنگیان پێنەدات و خەڵك بۆ شەڕی شامیەکان ببات. ئەو لەناو خەڵکی کوفە وتاریدا و سوپاسی

خوای کرد و وتی: دوای سلاو، هەر کەس شەڕ لەرێگای خوا پشت گوێ بخات و لەکارەکەی ئەودا سستی بکات، دەکەوێتە سەر لێواری هەڵدێری لەناوچون مەگەر ئەوەی خوا بەبەخشینەکانی خۆی لەکەوتن رزگاری بکات. لەخوا بترسن و لەگەڵ ئەو کەسانەدا شەڕ بکەن بۆ دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی هەستاون و هەوڵیاندا روناکی خۆا خامۆش بکەن. لەگەڵ گوناحکارە گومڕاکەرە ستەمکارەکان شەڕ بکەن چونکە ئەوان نەقورئان خوێنن و نە شارەزا لەپرسە دینیەکان و نەناشنا لەشەرع. شیاو نین بۆ فەرمانڕەوایی کردنی موسوڵمانان چونکە هیچ پێشینەیەکیان لەئیسلامدا نیە. سوێند بەخوا ئەگەر ببنە فەرمانڕەوایی ئێوە، کردارێکی هاوشێوەی هراکلیوس و خوسرەو لەگەڵ ئێوەدا دەگرنەبەر. ئامادەی بەرێکەوتن بۆ شەڕی دوژمن لەرۆژئاوا ببن و ئێمە نامەمان بۆ براکانتان لەبەسرە نوسی تا پەیوەستی ئێوە ببن. کاتێك کۆبونەوە، بەرێدەکەوین و هیچ هێز و توانایيەك جگە لەهێزی خوا نیە.

نامەی بۆ عەبدالله کوڕی عەباس نوسی: دوای سلاو، ئێمە لەلەشکرگای خۆمان لەنوخەیلە کۆبوینەوە و ئاهەنگی ئەوەمان هەیە بڕۆینە شەڕی دوژمنان لەرۆژئاوا. خەڵك بۆ شەڕ ئامادە بکە تا نێردراوکەی من بگاتە لای تۆ و لەجێگەکەی خۆتدا بمێنەرەوە تا فەرمانی من بەتۆ بگات. سلاو لەتۆ.

عەبدالله کوڕی عەباس نامەکەی بۆ خەڵك خوێندەوە وداوای لێکردن بەفەرماندەیی ئەحنەف کوڕی قەیس بۆ شەڕ بەرێکەون. هەزار و پێنسەد کەس هاتنەدەر. قسەی بۆ خەڵك کرد و وتی: ئەی خەڵکانی بەسرە، نامەی سەروەری باوەڕداران بەمن گەیشت و من فەرمانی ئامادە بونم دەرکرد بەلام جگە لەهەزار وپێنسەد کەس، کەس ئامادەییان نیشان نەدا لەگەڵ ئەوەی ئێوە، جگە لەمناڵ و کۆیلەکانتان، شەست هەزار پیاوی شەڕکەرن! ئێستا لەگەڵ جاریە کوڕی قودامەی سەعدی بەرەو لای ئەو بەرێکەون، کەس لەزیانی خۆی بیانو نەهێنێتەوە چونکە هەر کەس پاشەکشێ بکات، سزای دەدەم و هەر کەس ببینم بانگەوازی سەروەرەکەی خۆی پشت گوێ دەخات و نافەرمانی دەکات، سزایەکی قورسی دەدەم، دوای ئەوە کەس جگە لەخۆی سەرکۆنە ناکات.

جاریە ڕۆشتەدەر و هەزار و حەوتسەد کەس لەگەڵ ئەو رەوانە بون و ئەوان لەگەڵ هەزار وپێنسەد پیاوەکەی دیکە بونە سێ هەزارو دوسەد کەس و گەیشتنە لای عەلی.

گەورەکانی کوفە و سەرکردەی بنەماڵەکان و گەرەك و هۆزە جیاوازەکانی خەڵك ڕۆشتنە لای عەلی. ئەو سوپاسی خوای کرد و دواتر فەرموی: ئەی خەڵکی کوفە ئێوە برادەران و هاوڕێکانی من بەرەو ڕاستی و دروستی هاوخەباتەکانی من بۆ شەڕ دژی دوژمنانی خوایین. بەهێزی ئێوەیە نافەرمانان لەناو دەبەم و بەهێزی ئێوەیە هیوایی کورنوش بردن لەفەرمانبەرانم هەیە. داوای هاوکاریم لەخەڵکانی بەسرە کرد لەوان سێ هەزارو دوسەد کەس بۆ لای من هاتن. دەبێت سەرۆکی هەر هۆزێك ژمارەی شەڕکەران و منداڵەکانی ئەوان کەتوانایی شەڕ کردنیان هەیە و کۆیلەکان و پاشماوەکانی هۆزەکەی خۆی بۆ من بنوسێت و دەبێت ئەوان پەیوەستی ئێمە بکات.

سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، فەرمانبەر و بیسەرین. من یەکەم ڕازی بو بەبانگەوازەکەی تۆم. دواتر مەعقەل کوڕی قەیس و عودەی کوڕی حاتەم و زیاد کوڕی خەصەفە و حێجر کوڕی عودەی و گەورەکانی خەڵك و سەرکردەی هۆزەکان هەستان و ئەوەی عەلی داوای کردبو، ئەنجامیاندا. ناوەکانیان بۆنوسی و فەرمانیان بەمناڵ و کۆیلەکانی خۆیاندا لەگەڵ ئەوان بڕۆنەدەر و هیچ کەسێك پاشەکشێ نەکات. ناوی چل هەزار پیاوی شەڕکەر و حەفدە هەزار گەنج و هەشت هەزار کۆیلەیان نوسی و هەمو شەڕکەرانی کوفە جگە لەخەڵکانی بەسرە شەست و پێنج هەزار پیاوی شەڕکەر بون. خەڵکانی بەسرە سێ هەزار و دوسەد کەس بون.

بۆ سەعد کوڕی مەسعود نامەی بۆ مەداین نوسی و فەرمانی پێدا شەڕکەرانی خۆی بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە بکات.

عەلیان ئاگادار کردەوە خەڵکان چی دەڵێن: باشترە سەرەتا ئێمە سەرەتا بۆ شەڕی حەروریەکان ببات و کاتێك لەوان تەواو بوین بڕۆینە شەڕی دوژمنانی خوا. بەوانی وت: بیستومە ئەم قسانەتان کردوە. پێشنیارتان کردوە شەڕ لەگەڵ خەواریج بۆ ئێمە بەهادارترە. ئەوان لەبیر بکەن و بڕۆنە شەڕی ئەو کەسانەی شەڕ لەگەڵ ئێوە دەکەن تا ببنە پاشا ستەمکارەکان و خەڵکان بکەنە کۆیلەی بەدبەخت و چارەڕەش.

خەڵك هاواریان کرد: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ هەر شوێنێك دەتەوێت، ئێمە ڕەوانە بکە چونکە گیان لەبەر پێی تۆدا دەبەخشین. صەیفی کوڕی فەیسەڵی شەیبانی

هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئێمە هاوەڵان و هاوڕێیانی تۆین، لەگەڵ هەر کەسێك سەرپێچی فەرمانی تۆ بکات، دوژمنایەتی دەکەین و هەر کەس روبکاتە بارەگای تۆ، دەستی هاوڕێیەتی بۆ درێژ دەکەین. هەرکەس بێت و لەهەر شوێنێك بێت، ترسمان نیە. بەخواستی خوا تۆ لەم کەم بونی ژمارەی و سستی پیاوە شەڕکەرەکان ترست نەبێت.

## شەڕ لەگەڵ خەواریج

دەڵێن: کاتێك خەواریج لەبەسرەوە هاتن و لەنەهرەوان نزیك کەوتنەوە، دەستەیەك لەوان پیاوێکیان بینی ژنێکی لەسەر کەرێك دانیشاندوە و بۆ پێشەوەی دەبات. ئەویان بانگ کرد و بێ بەزەییانە پێش خۆیان خست و تۆقاندیان. پێیان وت: کێیت؟

وتی: عەبداللە کوڕی خەباب کوڕی ئەرەت هاوەڵی پێغەمبەر

وتیان: تۆمان ترساند؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: ترست لەسەر نیە. حەدیسێکمان بۆ بڵێ لەو حەدیسانەی باوکت کە لەپێغەمبەر بیستویەتی تا کەڵکی لێوەربگرین.

وتی: باوکم حەدیسێکی بۆ گێڕامەوە لەپێغەمبەر کەدەیوت: بەم زوانە ئاژاوەیەك دروست دەبێت و دڵی پیاو تیایدا دەمرێت بەهەمان شێوە کەجەستەی دەمرێت. پیاو، رۆژ بەخواپەرەستی دەکاتە شەو و شەو ناباوەڕ دەکاتە بەیانی. بەیانی ناباوەڕ و شەو دەبێتە خوا پەرەست.

وتیان: بۆ ئەم حەدیسە بو پرسیارمان لەتۆ کرد، سەبارەت بەئەبوبەکر و عومەر چی دەڵێیت؟

ئەم دوانەی وەسف کرد.

وتیان: سەبارەت بەسەرەتا و کۆتایی خەلافەتی عوسمان چی دەڵێیت؟

وتی: لەسەرەتا و کۆتایی لەسەر راستی و دروستی بو.

وتیان: سەبارەت بەعەلی پێش هەڵبژاردنی داوەر و دوای ئەوە چی دەڵێیت؟

وتی: ئەو لەفەرمانی خوا لەئێوە ئاگادارترە و زیاتر رێزی دینەکەی خۆی دەگرێت و

تێڕوانینێکی قووڵتری هەیە.

وتیان: تۆ لایەنگری مەبەستی دڵی خۆت دەکەیت و پیاوەکانت لەسەر بنەمای ناوەکانیان خۆش دەوێت نەك لەسەر بنەمای کارەکانیان. سوێند بەخوا بەدەم ئەشکەنجەوە بەشێوەیەك دەتکوژین پێشتر کەسمان بەو شێوەیە نەکوشتبێت.

ئەویان گرت و بازویان بەست و لەگەڵ ژنە دوگیانەکەی بۆ پێشەوەیان برد تا گەیشتنە دارخورما بەردارەکان لەمیوە. یەکێك لەوان خورمایەکی سەر زەوی هەڵگرت و و خستیە ناو دەمی. ئەویتریان وتی: بەناڕەوا خواردت و بەهاکەیت بەخاوەندەکەی نەدا. خورماکەی لەدەمی فڕێدا. دواتر بەرازێك لای ئەوان تێپەڕی کرد کە سامانی یەکێك لەپیاوە ئەماندراوەکان بو. یەکێك لەوان بەشمشێرلێیدا و کوشتی. وتیان: ئەمە فیرۆییە لەسەر زەوی. ئەو پیاوە ڕۆشتە لای خاوەن بەرازەکە و بەهاکەیدا و رازی کرد. کاتێك عەبداللە کوڕی خەباب کرداری ئەوانی بینی، وتی: ئەگەر لەم کارانەی دەیکەن، راستگۆ بن، ترسم لەئێوە نیە، من موسوڵمانم و لەئیسلام کارێکی ناڕەوام نەکردوە، ئێوە منتان ئەماندا و وتتان، هیچ ترسێك لەسەر نیە.

ئەویان خەواند و سەریان بڕی و خوێنەکەی لەناو ئاودا رەوان بو. دواتر رویان کردە ئەو ژنە. وتی: من ژنم، ئایا لەخوا ناترسن؟ ورگی ئەویان دڕی و سێ ژنیان لەتەی کوشت و ژنێکی دیکە بەناوی دایکی سەنانی سەیداوی.

کاتێك عەلی هەواڵی ئەم کارەی بیست و ئاگادار بویەوە کەئەوان ڕێگری لەخەڵك و چەتەیی دەکەن . وتی: سوێند بەخوا ئەگەر هەمو جیهان شایەتی بدەن لەرشتنی خوێنی عەبداللە کوڕی خەباب بەشدار بون، بێ درەنگ هەموویان دەکوژم.حارس کوڕی مورەی عەبدی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد تا بڕواتە لای ئەوان و بزانێت چی رویداوە و هەمو روداوەکان یادداشت بکات و هیچ شتێك نەشارێتەوە. کاتێك گەیشتە لای ئەوان و پرسیاری لێکردن، ئەویان کوشت. ئەم هەواڵە بەعەلی گەیشت و خەڵکی لەگەڵدا بو. وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەسەر چ بنەمایەك ئەوان پشت گوێ بخەین؟ چۆن ئەوان بەجێبێڵین لەکاتێکدا بەسەر سامان و ژن و منداڵەکانی ئێمەدا زاڵبن؟ ئێمە بۆ شەڕی ئەوان ببە تا کاتێك لەوان تەواو بوین، بۆ شەڕی دوژمنانمان لەشام بڕۆین.

ئەشعەس کوڕی قەیس هەستا و قسەی لەم شێوەی کرد. خەڵك گومانیان دەکرد ئەو

بەدڵ لەگەڵ ئەواندایە چونکە لەشەڕی صەفین لەکاتی هەڵکردنی قورئانەکان، دەیوت: خەڵکێك داوای داوەری قورئان بکەن، خەڵکانێکی دادپەروەرن. کاتێك قسەکانی ئەمڕۆی هێنایە سەر زمان، هەستیان بەوە کرد کە لەگەڵ ئەوان سازگار نیە.

عەلی بۆچوونەکەی ئەوانی پشت راست کردەوە و ڕۆشت و لەروبار تێپەڕی و بەرەو لای ئەوان رەوانە بو. لەرێگادا ئەستێرە ناسێك روبەروی بویەوە و داوای لێکرد لەکاتێکی دیکە لەرۆژدا بەرێکەوێت. پێی وت: ئەگەر جیاواز لەو کاتەی من پێت دەڵێم، بەرێکەویت، خۆت و هاورێکانت زیانێکی قورستان بەردەکەوێت. عەلی ناسازگاری ئەوی کرد و لەکاتێکی جیاواز لەکاتە پێشنیارە کراوەکەی ئەو بەرێکەوت. کاتێك لەنەهرەوانیەکان تەواو بو، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: ئەگەر لەکاتێکدا بەرێدەکەوتین کەئەستێرەناس پێشنیاری پێکردین، ئەو نەزانانەی هیچ نازانن، دەیانوت: لەکاتێکدا بەرێکەوت کەئەستێرەناس پێشنیاری کرد ولەبەر ئەمە بو سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ناوی ئەستێرەناسەکە موسافیر کوڕی عەفیف بو.

عەلی کەسی بۆ لای نەهرەوانیەکان رەوانە کرد و پەیامیدا: بکوژی براکانمان لەناو خۆتان بەئێمە بسپێرن تا بیانکوژین. دواتر دەست لەئێوە هەڵدەگرین وبەجێتان دێڵین تا روبەروی رۆژئاواییەکان ببینەوە تا ئەو کاتەی خوا دڵەکانی ئێوە بۆ لای ئێمە دەگەرێنێتەوە و ئێوە بەرەو چارەنوسێك دەبات لەوەی ئێستاتان باشتر بێت.

وتیان: هەمومان ئەوانمان کوشت و هەمومان ڕشتنی خوێنی ئەوان و ئێوە بەڕەوا دەزانین.

قەیس کوڕی سەعد کوڕی عبادە ڕۆشتە لای ئەوان و پێی وتن: ئەی بەندەکانی خوا، بکوژەکان لەناو خۆتان بۆ لای ئێمە رەوانە بکەن و پەیوەستی ئێمە ببن و لەگەڵمان بۆ شەڕی دوژمن رەوانە ببن چونکە کارێکی گەورە و ئەستەمتان کردوە. شایەتی بۆ بتپەرستی ئێمە دەدەن و بوێرانە خوێنی موسوڵمانان دەرێژن.

عەبدالله کوڕی شەجەرەی سەلی وتی: راستی و دروستی بۆ ئێمە ئاشکرا بوە و لەبەر ئەمە شوێن ئێوە ناکەوین تا ئەو کاتەی پیاوێکی وەك عومەر کوڕی خەتاب دەکەنە خەلیفەی خۆتان.

قەیس وتی: پیاوێك هاوشێوەی عومەر جگە لەم خەلیفەی خۆمان ناناسین. ئایا

ئێوە لەناو خۆتاندا کەسێکی لەو چەشنە دەناسن؟

وتیان: نە.

قەیس وتی: ئێوە لەبەرابەر خۆتان بەخوا سوێند دەدەم خۆتان لەناو مەبەن چونکە تەنیا ئەوە دەزانم ئاژاوەچیەتی بەسەر ئێوەدا زاڵبوە.

ئەبو ئەیوبی ئەنساری قسەی بۆ ئەوان کرد و وتی: ئەی بەندەکانی خوا، ئێمە و ئێوە لەسەر هەمان پەیمانی پێشومانین. ئایا لەنێوان ئێمەدا سازگاری نەبو؟ لەبەر چی دژایەتی ئێمە دەکەن؟

وتیان: ئەگەر ئەمڕۆ شوێن ئێوە بکەوین، سبەینێ، داوەر هەڵدەبژێرنەوە.

ئەبونەیوب پێی وتن: سوێندتان دەدەم بەخوا لەترسی ئاژاوەی سبەی، بەرەو ئاژاوەی ئەمڕۆ رامەکەن.

عەلی ڕۆشتە لای ئەوان و وتی: ئەی ئەو کەسانەی سەرسەختی و یاخیگەری ئێوەی لەماڵەکانتان دەرپەڕاندوە و لەراستی و دروستی دوری کردونەتەوە و نەزانان هیوایان بەئێوە بەستوە و خۆیان هەڵداوەتە هەڵدێرێکی قووڵ! ئاگادارتان دەکەمەوە بەرەبەیانی سبەی خەڵك نفرینی ئێوە دەکەن وئێوە لەناو خاك و خوێندا دەگەوزێن و لەنێوان ئەم دۆڵە، لەسەر زەوی دەکەون و هەر چاڵێك لەئێوە پڕدەبێت بێ ئەوەی نیشانەیەکی ئاشکرا لەخوا دەستی ئێوە بگرێت یا بەڵگەیەکی رون بۆ لای پەروەردگار رێنوێنیتان بکات. مەگەر ئێوەم لەهەڵبژاردنی داوەر بەدور نەگرت و لەفریوی ئەوان ئاگادارم نەکردنەوە؟ پێم وتن: خەڵکانی شام لەدین بێزارن و لەگەڵی نامۆن، بەڵام ئێوە نافەرمانی منتان کرد. کاتێك داوەرم هەڵبژارد پەیمان وەرگرت و سوێندم لەداوەران سەند ئەوەی قورئان بەزیندویی هێشتویەتیەوە، بەزیندویی بیهێڵنەوە و ئەوەی مراندویەتی، بیمرێنن. ئەم دوانە لەگەڵ یەك ناسازگار بون و بەهەمان شێوە لەگەڵ نوسراوی خوا و پێغەمبەریش. ئێمە پەیوەندیەکانی ئەوانمان پچڕاند و لەسەر پەیمانەکەی خۆمانین. ئێوە لەکوێوە هاتون و لەسەر بنەمای چ پەیمانێك کار دەکەن؟

وتیان: ئێمە داوەرمان هەڵبژارد و کاتێك ئەو کارەمان کرد، گوناحمان کرد و بەدینی خوا ناباوەڕ بوین. ئێمە بۆ خوا گەڕاینەوە و ئەگەر تۆیش دان بەگوناحکاری خۆتدا دەنێیت و بۆ خوا دەگەڕێیتەوە، ئێمە لەگەڵ تۆ دەبین. ئەگەر رازی نەبیت، هەمومان

ئاگادارت دەکەینەوە و شەڕت لەگەڵ دەکەین.

عەلی وتی: گێژەڵوکەیەکی مەرگ هێنەر بگاتە سەرتان و پەیکی مردن دەستی بەئێوە بگات و هەموتان تادوایین کەس لەناو ببات. ئایا دوای ئەوەی باوەڕم بەپێغەمبەر هێنا و لەرێگای خوا کۆچم کرد و شەڕم کرد، شایەتی بۆ ناباوەڕی خۆم بدەم! ئەگەر ئەم کارە بکەم، گومڕا بم و هیچ کات لەرزگار بوان نەبم. دواتر ئەوانی بەجێهێشت.

دەستەیەك دەڵێن: وتارەکەی عەلی ئەمە بو: ئەی ئەو کەسانەی پشتتان کردۆتە پیاوەتی و ئازایەتی، جەستەی ئێوە ئەم ئەندێشە کاڵ و کرچەی لەدڵتانا پەروەردە کردوە کەمن دەست لەم داوەری کردنە کەخۆتان دەستان پێکرد و داواتان لەمن کرد و من پێی رازی نەبوم، هەڵگرم. بەئێوەم وت ئەم خەڵکە لەبەر ئەوە داوای داوەری دەکەن تا داوێك لەرێگای ئێوەدا بڵاو بکەنەوە و فریوتان بدەن و سستی و لاوازی لەنێوان ئێوەدا دروست بکەن. وەك ناسازگاران فەرمانبەری منتان نەکرد و وەك سەرپێچیکەران و یاخیبوان و گوناحکاران رێگەی ناسازگاریتان گرتەبەر تا ئەوەی من بەبۆچونەکەی ئێوە رازی بوم، بۆچونی دەستەیەکی نەزان و بێ مێشك و بێ ئاوز. سوێند بەخوا بەم شێوەن و زیاتر لەمە شیاو نین، ئەی بێ باوکان! نە قسەی ناشیرینم وت و لەکارەکانتان فریومدان، نەشتێکم لەئێوە شاردەوە نەئێوەم بەرەو تاریکی برد و نەدژواری و سەختیم بەسەر ئێوەدا بارند. کاری موسوڵمانان رون و ئاشکرا بو. بۆچونی هەموتان لەسەر ئەو بڕوایە بو دو کەس هەڵبژێرن و ئێمە پەیمانمان لێوەرگرین نوسراوی قورئان بەکار ببەن و چاوپۆشی لێنەکەن. ئەم دوانە، رویان کردە بیابانی گومڕایی و راستی و دروستیان پشت گوێ خست لەگەڵ ئەوەی بەجوانی دەیانبینی. بەڵام مەبەستی ئەوان ستەمکاری و بەهێزی دین لەدەستی ئێمەدا بو. ئەمە لەکاتێکدا بو ئەوان لەشارێگەی راستی و دروستی دورکەوتنەوە و شتێکی نامۆیان دروست کرد. بۆئێمەی رون بکەنەوە لەسەر چ بنەمایەك شەڕی دژی ئێمە بەڕەوا دەزانن و ئێمە بەجێدێڵن و شمشێری خۆتان دەخەنە سەر شان و لەسەر رێگاکان دادەنیشن و کوشتاریان دەکەن؟ ئەمە هەمان زیانە ئاشکراکەیە. سوێند بەخوا ئەگەر لەسەر ئەم کارە جوجکێکیان سەر دەبڕی لای خوا بەهەمان ئەندازە گران بو چ بگات

بەوەی گیانێکی پاکی موسوڵمان کەرشتنی خوێنی لەناو دین کارێکی نارەوایە.

خەواریج هاوارپان کرد: قسەیان لەگەڵ مەکەن و مەبنە هاوزمانی ئەوان، بۆ دیداری خوا ئامادە بن. پەلە بکەن پەلە بکەن بەرەو بەهەشت! عەلی گەڕایەوە.

دواتر خەواریج کە لەرۆژئاوای پردی روبار بون، ئاهەنگی روبارەکەیان کرد. هاوەڵانی عەلی پێیان وت: لەروبارەکە تێپەڕین.

وتی: هەرگیز تێناپەڕن.

ئەوان پێشەنگێکیان رەوانە کرد کەرۆشت و هەواڵی هێنایەوە و رایگەیاند کەئەوان تێپەڕیان کردوە. نێوان ئەو لەگەڵ ئەوان ئاوبەستێك لەروبارەکەبو. لەبەرئەوەی پێشەنگەکە لەوان ترسابو، لەوان نزیك نەکەوتبویەوە و وتبوی: تێپەڕیان کردوە.

عەلی وتی: سوێند بەخوا لەروبارەکە تێنەپەڕیون چونکە کوشتارگای ئەوان لەمبەری پردەکەیە. سوێند بەخوا دەکەس لەنێوە ناکوژرێن و دەکەس لەوان رزگاری نابێت.

خەڵك سەبارەت بەوتەکانی ئەو گومانیان لا دروست ببو و هەندێك باوەڕیان پێی نەدەکرد. کاتێك بینیان خەواریج لەروبارەکە تێنەپەڕیون، هاواری الله ئەکبەریان بەرز کردەوە و عەلیان ئاگادار کردەوە.

وتی: سوێند بەخوا نەدرۆم کرد و نەدرۆیان بە من وتوە. دواتر هاورێکانی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. لەسەر باڵی راستی سوپاکەی خۆی حجر کوڕی عودەی کردە فەرماندە. فەرماندەیی باڵی چەپی بەشەبەس کوڕی رەبعی یا مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی سپارد. فەرماندەی سوارەکان ئەبو ئەیوبی ئەنساری، فەرماندەی پیادەکان ئەبو قتادەی ئەنساری و فەرماندەی خەڵکانی مەدینە کەحەوتسەد یا هەشسەد کەس بون، قەیس کوڕی سەعد کوڕی عبادە. خەواریجیش خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. فەرماندەیی باڵی راستی خەواریج زەید کوڕی حوصەینی تایی، باڵی چەپ شورەیح کوڕی ئەوفی عەبەسی، فەرماندەی سوارەکان حەمزە کوڕی سەنانی ئەسەدی و فەرماندەی پیادەکان حورقوص کوڕی زوهەیری سەعدی.

عەلی ئاڵای ئەمانی بەئەبوئەیوبی ئەنساری دا. ئەبوئەیوب پێی وتن: هەرکەس بێتە ژێر ئەم ئاڵایە، ئەمانی دەدرێت. هەروەها ئەو کەسەی خەڵك نەکوژێت و

چەتەیی نەکات و هەرکەس بۆ کوفە یا مەداین بگەڕێتەوە و لەناو خەواریج بڕواتەدەر، ئەمان دەدرێت. دوای ئەوەی بکوژی براکانمان کوشتار کرد، پێویستمان بەڕشتنی خوێنی ئێوە نیە.

فەروە کوڕی نەوفلی ئەشجەعی وتی: سوێند بەخوا نازانم لەسەر چ بنەمایەك لەگەڵ عەلی شەڕ دەکەین. بەباشی دەزانم بگەڕێمەوە تا هەمو شتێکم بۆ ئاشکرا ببێت و بزانم بۆ دەبێت شەڕی لەگەڵدا بکەم، یا بۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێمە و شوێنی بکەوم. ئەولەگەڵ پێنسەد سوار گەڕایەوە تا لەبەندنیجین و دەسکەرە دابەزی. دەستەیەکی دیکە بلاوەیان لێکرد وگەڕانەوە بۆ کوفە. سەد کەسیشیان رویان لەعەلی کرد. عەبداللە کوڕی وەهب هەزار وهەشتسەد کەسی لەگەڵ مایەوە. ئەوان دەستیان بەپێشڕەوی کرد. بەهاوەڵانی خۆی وتبو: دەست درێژیان مەکەنە سەر تا خۆیان شەڕ دەست پێبکەن. خەواریج هاواریان دەکرد: پێشڕەوی بەرەو بەهەشت! هێرشیان کردە سەر خەڵك و سوارەکانی عەلی بون بەدودەستە. دەستەیەك رویان لەباڵی ڕاست کرد و دەستەیەك لەباڵی چەپ. تیرهاوێژەکانیش ئەوانیان تیرباران کرد. سوارەکان لەچەپ و ڕاستەوە هێرشیان دەکردە سەریان و پیاوان بەشمشێر و ڕم کەوتنە گیانیان. ئەوەندەی نەخایاند ئاگری ئەوانیان دامرکاندەوە. کاتێك حەمزە کوڕی سەنان بینی هەمویان لەناو دەچن، هاواری لەهاورێکانی خۆی کرد: دابەزن! ئەوان مەبەستی ئەوەیان کرد لەئەسپەکانیان دابەزن بەلام ئەسوەد کوڕی قەیسی موورادی دەست بەجێ هێرشی کردە سەر ئەوان و سوارانی عەلیش بەهەمان شێوە. کاتژمێرێکی نەخایاند هەمویان لەناو چون. وەك بڵێی کەسێك بەوانی وت بمرن و هەمویان دەستبەجێ گیانیان ئەسپەردە کرد.

ئەبو ئەیوبی ئەنساری هاتە لای عەلی و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، زەید کوڕی حوصەینی تاییم کوشت، بەشێوەیەك ڕمم لەسینەی چەقاند لەپشتیەوە هاتەدەر. وتم: ئەی دوژمنی خوا، مژدەی دۆزەخت پێ دەدەم! وتی: بەیانی دەزانیت کام یەك لەئێمە بۆ ئاگر شیاوترە.

عەلی وتی: ئەو خۆی بۆ ئاگر شیاوترە.

هانی کوڕی خەتابی ئەزدی و زیاد کوڕی خەصەفە هاتنە لای و لەسەر کوشتنی

عەبداللە کوڕی وەهب شەڕیان دەکرد. عەلی پرسی: چیتان کرد؟

هەردوکیان وتیان: کاتێك ئەومان بینی، بەپەلە روبەروی بوینەوە و دو ڕممان لەسینەی چەقاند. عەلی وتی: لەرەوانە کردنی ئەو بەرەو جەهننەم هەردوکتان شەریکن.

جەیش کوڕی رەبیعەی کەنانی هێرشی کردە سەر حورقوص کوڕی زوهەیر و کوشتی و عەبداللە کوڕی زەحر خولانی هێرشی کردە سەر عەبداللە کوڕی شەجەری سەلەمی و ژیانی لێ سەندەوە. شورەیح کوڕی ئەوفی پشتی بەدیوارێکەوە بەست و درێژەی بەشەڕ کردن دا. زۆربەی ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو شەڕیان دەکرد، خەڵکی هەمەدان بون. وتی:

قد علمت جارية عبسيه ناعمة من اهلها مكفيه

انی ساحمی ثلمتی العيضيه

یانی: ئەی کچی نازەنینی عەبەسی، ئەو جەستە نەرم و قەڵەو و سپیە کەخەڵك رێزی لێدەگرن، بەباشی دەزانێت ئەم شەو رەخنەکەی خۆی بەهێز دەکەم.

قەیس کوڕی معاویە هێرشی کردە سەر و قاچی قرتاند و خستیە سەر زەوی. شورەیحی ئەوفی شەڕی لەگەڵ دەکرد و وتی:

القرم يحمی شوله معقولا

یانی: نێرینەی چوارشانەی بەهێز، هەرچەند بەستراوە بێت، رێز لە بێچوەکەی خۆی دەگرێت.

قەیس هێرشی کردە سەر و کوشتی. خەڵك وتیان:

اقتتلت همدان يوماو رجل اقتتلوا من غدوة حتی الاصل

ففتح الله لهمدان الرجل

یانی: رۆژێك خەڵکی هەمەدان لەبەرەبەیانەوە تا ئێواری لەگەڵ پیاوێك شەڕیان کرد و سەرئەنجام خوا شەڕی لەبەرژەوندی هەمەدانیەکان کۆتایی پێهێنا.

## کوژرانی ( پیاوی مەمکدار )

دەستەیەك دەگێڕنەوە عەلی پێش دەرکەوتنی خەواریج بەهاوەڵانی خۆی وت: بەم زوانە دەستەیەك لەخەڵکان بەهەمان شێوە کەتیر لەکەوان دەردەپەڕێت، لەدین دەچنەدەر. نیشانەی ئەوان (پیاوێکی دەست کورتە). زۆرجار ئەمەیان لەعەلی بیستبو. کاتێك ئەهرەوانیەکان سەریان قوت کردەوە، عەلی خەڵکی بۆ شەڕی ئەوان برد وئەوەی دەبێت روبدات، رویدا. کاتێك لەوان تەواو بو، بەهاوەڵانی خۆی وت، بەدوای پیاوی دەست کورتدا بگەڕێن. بەدوایدا گەڕان. دەستەیەك وتیان: نایدۆزینەوە. تەنانەت یەکێك لەهاوەڵانی وتی: پیاوی لەو شێوە بونی نیە. ئەو بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا لەناو ئەواندایە، سوێند بەخوا ئەدرۆ دکەم و ئەدرۆیان بەمن وتوە! دواتر پیاوێك هاتە لای و مژدەی پێدا و وتی: ئەی سەرورەی باوەڕداران ئەومان دۆزیەوە.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە ئەبو، بەڵکو پێش گەڕانی ئەو پیاوە، عەلی خۆی بەدوایدا گەڕا و سولەیم کوڕی سومامەی حەنەفی و رەیان صەبرە لەگەڵیدا بون. عەلی ئەوی لەچاڵێك لەقەراغ روبار هاورێ لەگەڵ پەنجا کوژراو دۆزیەوە. سەیری بازوی ئەوی کرد و بینی تیکە گۆشتێك هاوشێوەی مەمکی ئافرەت لەوێدا کۆبۆتەوە. شتێك وەك دوکمە لەسەر مەمکیەتی و موی ڕەشی پێوەیە. کاتێك رایان دەکێشا، درێژ دەبویەوە تا دەگەشتە دەستی و کاتێك بەرەلآیان دەکرد، دەگەڕایەوە شوێنەکەی خۆی. کاتێك ئەمەی بینی، هاواری کرد: خوا گەورەیە، ئەدرۆیان لەگەڵ من کردوە و نە درۆم لەگەڵ ئێوە کردوە. ئەگەر ئەدەبوە هۆی سستی و لاوازی ئێوە، پێم دەوتن خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی چی وتوە کەکاتێك کەسێك بەئاگایی و زانستەوە شەڕ لەگەڵ ئەوان بکات و راستی و دروستی بناسێت، چ پاداشتێکی گرانبایی بۆ ئەو دەست نیشان دەکرێت.

کاتێك لای ئەوان تێپەڕی و ئەوانی لەناو خاك و خوێندا بینی، وتی: هاوار لەرۆژگارتان! کەسێك زیانی بەئێوە گەیاند کە بۆ فریودان ئێوەی هەڵبژارد!

وتیان: ئەی سەرورەی باوەڕداران، چ کەسێك ئەوانی فریودا؟

وتی: شەیتان و گیانە گلاوەکان، ئەو گیانانەی فەرمانی خراپەیان پێدان و بەئارەزوی پوچ فریوی دان، گوناحەکان لەلایەکی دیکە خۆیانیان بۆ ئەوان رازاندەوە و ئاوانیان ئاگادار کردەوە تا سەرکەوتن بەدەست بێنن.

دەڵێن: ئەو هەمو شتەکانی ناو لەشکرگەی کۆکردەوە. چوارپێ و ساز وبەرگ و ئالاّ و کەرەستەکانی شەڕی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد و کالاّکانی دیکە و کەنیز و کۆیلەکانی بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە.,

عودەی کوڕی حاتەم لەناو کوژراوەکاندا سوڕا و کوڕی تەرەفە کوڕی عودەی دۆزیەوە و بەخاکی سپارد. دەستەیەك لەموسوڵمانان کوژراوەکانی خۆیان بەخاك سپارد. کاتێك ئەم هەواڵە بەعەلی گەیشت، وتی: ئەوان دەکوژن و دواتر بەخاکیان دەسپێرن؟ کۆچ بکەن، خەڵك کۆچیان کرد.

لەسوپاکەی عەلی تەنیا حەوت کەس کوژران. دەستەیەك دەڵێن: روداوەکە لەساڵی ٦٥٨/٣٨—٦٥٩ زایینی رویدا. یەکێك لەو کەسانەی هاورێ لەگەڵ عەلی کوژرا، یەزید کوڕی نەویرەی ئەنساری لەهاوەڵانی پێغەمبەربو. پێغەمبەری خوا مژدەی بەهەشتی پێبەخشیبو. ئەو یەکەم کەس بو کوژرا.

کاتێك عەلی لەنەهرەوانیەکان تەواو بو، لەناو خەڵکدا وتارێکی پێشکەش کرد. سەرەتا سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: خوا فەرمانی چاکەکاری پێداون و سەرکەوتنی کۆتایی بەئێوە بەخشیوە. ئێستا بێ درەنگ بەرەو لای دوژمن بەرێکەون.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، تیرەکانمان تەواو بوە، شمشێرەکانمان کول و نوکی رمەکانمان داکەوتوە بەشێوەیەك زۆربەیان لەدارێکی شکاو دەچن. بگەڕێینەوە بۆ شارەکانمان تا بۆ شەڕ خۆمان ئامادە بکەین و ئەگەری هەیە ژمارەمان زیاد بکات وبەم کارە توانایيەکی زیاترمان لەبەرابەر دوژمندا هەبێت. ئەو کەسەی دەستی بەقسەکردن کرد، ئەشعەس کوڕی قەیسی کەندی بو. بەرێکەوت تا لەنوخەیلە دابەزی و فەرمانی بەخەڵکدا لەناو سوپاکەی خۆیاندا بن و لەسەر جەنگ پشت ئەستور بن و کەمتر برۆنە سەردانی ژن و منداڵەکانی خۆیان تا بۆ شەڕی دوژمن بەرێدەکەون. خەڵك ماوەیەك لەناو لەشکرگا مانەوە و دواتر ئارام ئارام خزانەدەر و رۆشتنە ناو کوفە و ئەمە جگە لەگەورەپیاوان وسەرکردەکانی سوپا بو. لەشکرگا چۆڵ بو. کاتێك ئەمەی

بینی، بۆچونی ڕەوانە بون بەرەو لای دوژمن لەودا نەما و خۆیشی بەرەو کوفە بەرێکەوت. هەروەها بەوانی وت: ئەی خەڵکینە بۆ بەرێکەوتن بەرەو دوژمن یانی ئەو کەسانەی شەڕ لەگەڵ ئەوان هۆکاری نزیك کەوتنەوە لەخوای گەورەیە، ئامادە بن. شەڕ لەگەڵ ئەوان دەبێتە هۆی بەهێز بونی پەیوەندی ئێوە لەگەڵ خوا. ئەوان لەراستی و دروستی سەرگەردانن و لەبەرابەر نوسراوی خوا ستەمکار و کوێر و کەڕ و لەگومڕایی خۆیاندا نوقم دەبن. کەواتە لەبەرابەر ئەوان هەرچەندە دەتوانن شەڕکەری سوارە وپیادە کۆبکەنەوە و کاری خۆتان بەخوا بسپێرن و ئەو پشتیوان وپارێزەرتانە. بەڵام ئەکەس خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و نەکەس بۆ لەشکرگا گەڕایەوە. ئەو چەندین ڕۆژ ئەوانی لەحاڵی خۆیاندا هێشتەوە و کاتێك لەوان بێ هیوا بو، سەرکردەکان و گەورەکانی بانگ کرد و لەگەڵ ئەوان ڕاوێژی کرد وپرسی بۆ لاوازی و سستی لەخۆیان نیشان دەدەن. دەستەیەك لەوان بیانوی نابەجێیان هێنایەوە، دەستەیەکیان نارەزامەندیان نیشان دا و دەستەیەکی کەمیان کەوتنە جموجۆڵ.

وتارێکی بۆ ئەواندا و وتی: ئەی بەندەکانی خوا! ئێوە چیتان بەسەردێت کاتێك داواتان لێدەکەم بۆ شەڕی دوژمن ئامادە بن، (لەش قورس بەزەویەوە دەلکێن. ئایا بەژیانی ئەم جیهانە لەجیاتی ئەو جیهانە ڕازی بون؟ (توبە/٣٨/٩) ئایا ریسوایی و بەستیتان لەجیاتی شکۆ و ڕێزداری هەڵبژاردوە؟ هەرجار داواتان لێدەکەم بۆ شەڕی دوژمن ئامادە بن، چاوتان دەکەوێتە سوڕان وەك بڵێی لەسەر لێواری هەڵدێری مەرگن و وەك بڵێی دڵتان دەغەڵکارە و ئاوزی خۆتان بەکار نابەن و گومان دەکەم چاوتان کوێرە و بەهیچ ڕێگەیەك ناگەن. خوا لەباوکتان خۆش بێت! دەڵێی ئێوە شێرەکانی ژیانی جەنگەڵی ئاسودەن و ڕێویە فێڵبازەکان لەکاتی داواکاری شەڕ. تا کۆتایی ڕۆژگار نەشیاون بۆ پشتگەرمی من نە پیاوانی شەڕن. سوێند بەخوا، ئێوەن ئەوانەی ئاگری شەڕ بەنەزانی هەڵدەکەن! دەستدرێژی دەکەنە سەر ئێوە و نایکەن، لەهەر سوچ و قوژبنێك بەدواتانا دەگەڕێن و تێناکۆشن، چاوەکان بۆ زیان گەیاندن بەئێوە بەکراوەیی دەمێننەوە و ئێوە لەنائاگاییدا بەسەردەبەن و خەوتوانن. دواتر وتی: بەڵێ، من حەقێکم لەئەستۆی ئێوەدا هەیە و ئێوە حەقێك لەئەستۆی مندا. حەقی ئێوە ئەوەیە تا ئەو کاتەی کاروبارەکانی ئێوە لەدەستی مندا بێت، چاکەخوازی ئێوە بم، بێ کەم و

کوڕی بەخششتان پێ ببەخشم، فێرتان بکەم تا ئائاگا نەمێننەوە و شارەزایی کلتورتان بکەم تا ببنەکەسێکی فرەزان. حەقی من لەئەستۆی ئێوە پێبەند بونتان بەپەیمان و چاکەخوازی بۆ من لەبەرابەر من و لەپشت سەری من، وەڵامدانەوە لەکاتی داوا کردنی من بۆ کارێك و فەرمان بردن لەکاتی فەرماندان. ئەگەر خوابیەوێت چاکە بەئێوە بگەیێنێت، دەبێت لەوەی پەسەندی ناکەم خۆتان بەدور بگرن و لەوەی پەسەندی دەکەم، نزیك ببنەوە تا ئەوەی بەدواییدا دەگەڕێن بەدەستی بێنن ونەوەی ئارەزوی دەکەن، پێی بگەن.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

دەڵێن: لەم ساڵەدا عوبەیداللە کوڕی عەباس، فەرمانڕەوایی عەلی لەیەمەن، لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. فەرمانڕەوایی تایف و مەککە قسم کوڕی عەباس بو، لەمەدینە سەهل کوڕی حەنیف یا تەمام کوڕی عەباس و لەبەسرە عەبداللە کوڕی عەباس و لەمیسر محەممەد کوڕی ئەبی بەکر. کاتێك عەلی بەرەو صەفین بەرێکەوت، ئەبومەسعودی ئەنساری کردە جێگری خۆی لەکوفە. فەرمانڕەوایی خوراسان خولەید کوڕی قورەی یەربوعی و شام لەدەستی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان.

لەم ساڵەدا حازم کوڕی ئەبی حازم برای قەیس کوڕی ئەبی حازمی ئەحمەسی بەجەلی لەصەفین کوژرا.

خەباب کوڕی ئەرت لەم ساڵەدا مرد. لەشەڕی بەدر و شەڕەکانی دوای ئەوە بەشداری کرد ولە شەڕی صەفین و شەڕی نەهرەوان ئامادە بو و دەستەیەك دەڵێن بەشداری نەکرد. ئەو نەخۆش و دوای گەشتنی عەلی بۆ کوفە مرد. پێشتر ئاماژەمان پێدا. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٥٩/٣٩ زاییندا مرد. ژیانی ئەو شەست و سێ ساڵی خایاند.

لەم ساڵەدا ئەبولهەیسەم کوڕی تیهان لەصەفین لەناو سوپاکەی عەلیدا کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: تا ماوەیەك دوای شەڕی صەفین زیندو بو. باوکی ئەبولهەیسەم یەکەم کەس بو لەشەوی عەقەبە لەگەڵ پێغەمبەر بەیعەتی کرد. یەکێك لەمێژوونوسان ئاماژەی بەم گێڕانەوەیە داوە. ئەو لەشەڕکەرانی بەدر بو.

هەروەها لەم ساڵەدا یەعلی کوڕی مونیە مرد. مونیە ناوی دایکی ئەوە و ناوی باوکی

ئەو ئومەیە تەمیمیە. ئەو کوڕی خوشك یا کوڕی پوری عەتەبە کوڕی غەزەوانە. ئەو لەشەڕی وشتر لەناو سوپاکەی عایشەدا شەڕی کرد و لەشەڕی صەفین لەناو سوپاکەی عەلیدا کوژرا. ئەو لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنا و لەشەڕی حونەین بەشداری کرد.لەم ساڵەدا ئەبوعەمرەی ئەنساری باوکی عەبدولرەحمان لەصەفین لەناو سوپاکەی عەلیدا کوژرا. ئەو لەشەرکەرانی بەدر بو.

بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا ئەبو فەزالەی ئەنساری، لەشەڕکەرانی بەدر مرد.

بەوتەی دەستەیەك، لەم ساڵەدا سەهل کوڕی حەنیفی ئەنساری، لەبەدریەکان مرد. ئەو لەشەڕەکانی عەلی بەشداری کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا صوهەیب کوڕی سەنان و صەفەوان کوڕی بەیزا مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرەح بەشێوەیەکی لەناکاو لەکاتی نوێژ لەعەسقەلان مرد. ئەو نەیویست لەگەڵ عەلی بەشداری لەشەڕی صەفین بکات. دەستەیەك دەڵێن: لەم شەڕەدا بەشداری کرد بەڵام ئەمە راست نیە.

## ڕوداوەکانی ساڵی سی و هەشتی کۆچی ( ٦٥٧-٦٥٨ زایینی )

## زاڵبونی عەمرۆعاص بەسەر میسر

## کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری صدیق

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەبی بەکری صدیق، فەرمانڕەوایی میسر لەلایەن عەلیەوە کوژرا. هۆکاری دەست نیشان کردنی ئەو لەمیسر و لەسەر کارلابردنی قەیس کوڕی سەعدمان لەفەرمانڕەوایی میسر و ڕۆشتنی محەممەد بۆ میسرمان پێشتر ئاماژە پێدا و وتمان ئەو کوڕی موزاهیم کوڕی کەلبی بەرەو خەڵکی خەرەنبا رەوانە کرد. کاتێك کوڕی موزاهیم بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت، ئەویان کوشت. معاویە کوڕی حودەیجی سەکونی لەمیسر داوای خوێنی عوسمانی کرد و دەستەیەك لەدەوری کۆبونەوە و میسر بەرەو فیرۆیی ڕۆشت و کاروبارەکان لەدەستی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر نەما. هەواڵی ئەم کارە بەعەلی گەیشت. فەرموی: تەنیا دو کەس دەتوانن میسر بەهێز و سەقامگیر بکەن: هاورێکەمان کە لەسەر کار لامان برد یانی قەیس کوڕی سەعد و ئەویتریان مالك ئەشتەری نەخەعی. ئەشتەر دوای شەڕی صەفین گەڕابویەوە بۆ سەر کارەکەی خۆی لەجەزیرە. عەلی بەقەیسی وت: لای من بمێنەرەوە و فەرماندەیی لەدەست بگرە تا کاروباری داوەری تەواو ببێت و دواتر بەرەو ئازەربایەجان برۆیت. کاتێك چۆنیەتی کاروباری میسر بەعەلی گەیشت، نامەیەکی بۆ ئەشتەر نوسی کە لەنەصیبین بەسەری دەبرد و بانگی کرد. ئەو هاتە لای عەلی و عەلی ئەوی لەکاروبارەکان ئاگادار کردەوە. پێی وت: ئەم کارە تەنیا لەئەستۆی تۆ بەردێت. بەرەو میسر بەرێکەوە، ئەگەر من پێشینارە پێویستەکان بەتۆ نەکەم، بەبۆچونی خۆت بەسەندە دەکەم. داوای هاوکاری لەخوا بکە، نەرمی و ئاشتی تێکەڵ بکە، تا ئەو شوێنەی نەرمی کاریگەرە، نەرمی بنوێنە وئەگەر چارەیەك جگە لەتوند و تیژی نەبو، کەڵکی لێوەربگرە.

ئەشتەر بەرێکەوت و کەل و پەلی پێویستی هەڵگرت و خۆی ئامادە و تەیار کرد و

بەرەو میسر بەڕێکەوت. سیخوڕەکانی معاویە لەم کارە ئاگاداریان کردەوە. معاویە کەچاوی تەماحی لەمیسر بڕیبو، پەرێشان وئەم کارەی لای ئەو دژوار بو. زانی ئەگەر ئەشتەر بڕواتە میسر، زیاتر لەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکر گوشار دەخاتە سەر ئەو. لەبەر ئەمە کەسێکی بۆ لای سەرەپەرەستی باج وەرگرتن لەقەلزەم رەوانە کرد و پێی وت: مالکی ئەشتەری نەخەعی ئاهەنگی میسری کردوە، ئەگەر ئەو لەناو ببەیت، تا هەیت و هەم، باج لەتۆ وەرناگرم. ئەو لەحابسات (خانسیار، حایستار) ڕۆشتەدەر و لەقەلزەم دابەزی. ئەشتەر لەعێراقەوە بەرەو میسر بەڕێکەوت. کاتێك گەیشتە قەلزەم، ئەو پیاوە پێشوازی لێکرد و پێشنیاری کرد دابەزێت و میوانی ئەو بێت. ئەشتەر لای ئەو دابەزی. کاتێك خواردنی هێنا، خواردنەوەیەکی لەهەنگوین بۆهێنا کەتیکەڵ بەژەهر بو، دەرخواردیدا. ئەشتەر خواردیەوە و گیانی سپارد.

معاویە رویکردە شامیەکان و وتی: عەلی ئەشتەری نەخەعی رەوانە میسر کردوە. لەخوا بپاڕێنەوە. خەڵکانی شام رۆژانە لەخوا دەپاڕانەوە. ئەو کەسەی ژەهری دەرخوارددابو، هاتە لای معاویە و لەمردنی ئەشتەری نەخەعی ئاگاداری کردەوە. معاویە وتارێکیدا و وتی: دوای سلاّو، عەلی دو بازوی راستی هەبو کە یەکیان لەشەڕی صەفین بڕا (عەماری یاسر) و یەکیتریان ئەمڕۆ لەجەستەی ئەو جیابویەوە (مالکی ئەشتەر).

کاتێك هەواڵی مەرگی بەعەلی گەیشت وتی: هاوار لەدودەست و یەك دەم. دەستەیەکی دیکە دەڵێن: کاتێك هەواڵی مردنەکەی بیست، فەرموی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). مالك! مالك خۆی گەوهەرە! ئایا دایکێك دەتوانێت وەك مالکێك بێنێتە دنیا! ئەگەر لەئاسن دەبو، زنجیری لەپێی دوژمن دەبەست، و ئەگەر تاشەبەردێك دەبو، بەردێکی دەکێشا بەسەری خراپەکاران و چقڵێکی لەچاوی دەچەقاند! پیاوێکی لەم شێوە، شیاوە کاتێك لەدەست بڕوات ژنان بگرین و شینی بۆ بگێڕن.

ئەشتەر لەعومەر کوڕی خەتاب و عەلی و خالید کوڕی وەلید حەدیسی گێڕاوەتەوە و دەستەیەك لەو. ئەحمەد کوڕی صالح دەڵێت: پیاوێکی بەهێز و راستگۆ بو.

کاتێك هەواڵ بەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکری صدیق گەیشت کەعەلی ئەشتەری

نەخەعی ڕەوانە کردوە، ڕەنجا و ئەم کارەی پێ ناخۆش بو. عەلی بۆی نوسی: دوای سڵاو، هەواڵ بەمن گەیشتوە کەڕەنجاویت لەبەر ئەوەی ئەشتەری نەخەعیم وەك فەرمانڕەوایی کاری تۆ ڕەوانە کرد. لەبەر ئەوە ڕەوانەم نەکرد سستی و لاوازیم لەکاری تۆ دیبێت یا بمەوێت هەوڵەکانی خۆت زیاتر بکەیت. ئەگەر ئەوەی لەژێر فەرمانی تۆدایە، لەتۆم دەسەندەوە، تۆم دەکردە لێپرسراوی کارێك کەدژواری کەمتر و فەرمانڕەوایی کردنی ئەو، زیاتر ئارەزو بکەیت. ئەم پیاوە ڕێزدارەی ڕەوانەم کرد بۆ من هاورێیەکی چاکەخواز و بۆ دوژمنم زیانێکی گیانستێن بو. ئەو ڕۆژەکانی خۆی تەواو کرد ولەگەڵ پەیکی مەرگ سەفەری کرد. ئێمە لەو ڕازین، خوا لێی ڕازی بێت وپاداشتی بداتەوە. لەبەرابەر دوژمن خۆڕاگر بە و بۆ شەڕ خۆت ئامادە بکە. بەچاکەکاری و فەرزانی خەڵك بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا بانگ بکە (نحل/١٦/١٢٥). بەردەوام لەخوا بپارێرەوە و داوای هاوکاری لێبکە و تەنیا لەو بترسە تا خەمەکانی تۆ کەم بکاتەوە و بۆ فەرمانڕەوایی پشتیوانت بێت.

محەممەد بۆی نوسی: دوای سڵاو، نامەکەی تۆ بەدەستی من گەیشت و تێگەیشتم. هیچ کەس لەمن ڕازیتر لەفەرمانی سەروەری باوەڕداران و شەڕکەرتر لەگەڵ دوژمنان و مێهرەبانتر لەگەڵ یاران نیە. ڕۆشتمەدەر و ئوردوم لێدا و خەڵکم ئەماندا جگە لەو کەسانەی دژایەتی ئێمە دەکەن و ناسازگاریمان لەگەڵ دەگرنە بەر. من شوێنکەوتویی فەرمانی سەروەری باوەڕداران و پارێزەری فەرمانەکانی ئەوم. سڵاو و ماڵئاوا.

دەستەیەك دەڵێن: ئەشتەر دوای کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بو بەفەرمانڕەوایی میسر.

لەم زەمانەدا خەڵکانی شام چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی کاروبارەکانی ئەویان دەکرد. کاتێك دو داوەرەکە بلاوەیان لێکرد، خەڵکانی شام وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ معاویە کرد و ژمارەیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبو. عێراقیەکان لەفەرمانبردنی عەلی پرژوبلاو بونەوە. معاویە تەنیا بیری لەمیسر دەکردەوە و لەخەڵکەکەی دەترسا چونکە لەو نزیك و بەتەواوی دژی لایەنگرانی عوسمان دەوەستانەوە. هیوایی دەخواست ئەگەر بەسەر میسردا زاڵ بێت لەشەڕ دژی عەلی سەرکەوتن بەدەست بێنێت چونکە باجەکەی فراوان بو. معاویە ئەمانەی لەدەوری خۆی کۆکردەوە:

عەمرۆعاص، حەبیب کوڕی موسلیمە، بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا ، زوحاك کوڕی قەیس، عەبدولرەحمان کوڕی خالید، ئەبوئەعوەری سولەمی و شورەحبیل کوڕی سیمتی کەندی. بەوانی وت: ئایا دەزانن بۆ کۆبونەوەتان لەگەڵ دەکەم؟ بۆکارێك کە بۆمن بەهادارە.

وتیان: خوا کەسی لەکارە نهێنیەکان ئاگادار نەکردۆتەوە و ئێمە نازانین چیت دەوێت.

عەمرۆعاص وتی: ئێمە کۆکردۆتەوە تا بۆچونی ئێمە سەبارەت بەمیسر بزانیت. ئەگەر بۆ ئەمە راوێژمان لەگەڵ دەکەیت، بەهێز و خۆڕاگر بە. بۆچونێکی راستە ئەگەر دەتەوێت دەستی بەسەردا بگریت. ئەم کارە رێزداری خۆت و هاورێکانت ولەناوچونی دوژمنان و خراپەخوازانی بەدواوە دێت.

معاویە وتی: ئەی کوڕی عاص تۆ بەردەوام بەدوای مەبەستەکانی خۆتەوەیت! عەمرۆ عاص لەسەرەتاوە لەسەر ئەو بنەمایە لەگەڵ معاویە رێککەوتبو ئەگەر شەڕی عەلی بکات تا ئەو کاتەی زیندو بێت، میسر و خەڵکەکەی بۆ ئەو بێت.

معاویە روی کردە ئەوانی دیکە وتی: باوکی عەبدالله راست دەکات، ئێوە چی دەڵێن؟

وتیان: بەبۆچونەکەی عەمرۆعاص رازی دەبین.

وتی: چی بکەم چونکە عەمرۆ هەمو شتێکی باس نەکرد.

عەمرۆ وتی: بۆچونم وایە سوپایەکی گەورە بەفەرماندەیی پیاوێکی دورئەندێش و خۆڕاگر رەوانە بکەیت کەلێی ئاسودە بیت و پشتی پێ ببەستیت. دەبێت بڕواتە میسر. لەوێ کەسەکانمان پەیوەستمان ببن و لەبەرابەر دوژمن هاوکاریمان بکەن. ئەگەر سوپاکەی تۆ و خەڵکانی ئەوێ، هاودەست ببن، هیوادارین خوا سەرکەوتنت پێ ببەخشێت.

معاویە وتی: بۆچونی من وایە نامە بۆ کەسەکانمان لەوێ بنێرین وئەوان بەئارەزوەکانی خۆمان هان بدەین و فەرمانیان پێ بدەین، خۆڕاگر بن. نامە بۆ دوژمنان بنێرین و داوای ئاشتیان لێ بکەین و سوپاسی خۆمانیان بۆ دەربڕین و لەشەڕ کردن دژی خۆمان بیانترسێنین و فریویان بدەین. ئەگەر ئەوەی دەمانەوێت، بێ شەڕ کردن دەستمان کەوێت، ئەوە دەبێت کە لەسەرەتاوە ئارەزومان کردوە و گەرنە

دواتر هێرشیان دەکەینە سەر. ئەی کوڕی عاص تۆ بەسەختگیری و پەلە کردن بەخت بکەرە هاوڕێی خۆت و من بەنەرمی و مێهرەبانی.

عەمرۆ وتی: هەر کارێك نارەزوی دەکەیت، ئەنجامی بدە، بەڵام دڵنیابە ئەم کارە تەنیا بەجەنگ دەکرێت.

معاویە بۆ موسلیمە کوڕی موحەلەد و معاویە کوڕی حودەیجی سەکونی نامەی نوسی. ئەم دوانە دژایەتی عەلیان دەکرد. سوپاسی ئەوانی کرد و ئەوانی بۆ داوا کردنی خوێنی عوسمان هاندا و مژدەی پێدان لەفەرمانڕەوایی بەشداریان دەکات. نامەکەی بەکۆیلەکەی خۆی سوبەیع رەوانە کرد.

کاتێك ئەو دوانە نامەکەیان خوێندەوە، موسلیمە کوڕی موخەلەدی ئەنساری لەلایەن خۆی و کوڕی حودەیج وەڵامی دایەوە: دوای سڵاو، کارێك کەگیانی خۆمان لەپێناودا بەخشی و فەرمانی خوامان بەکار بەست، کارێکە چاوەڕوانی پاداشتی خوایی لێدەکەین و سەرکەوتن بەسەر ناسازگاران و بەپەلە چاوەڕوانی تۆڵەسەندنەوەی کوژەران لەبکوژەکانی خوێنی رێبەرەکەمان. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەبەشداری کردنی ئێمە لەفەرمانڕەوایی نوسیت، سوێند بەخوا ئەو شتە نیە نارەزومان دەکرد و خوازیاری بوین. خێرا لەگەڵ سوارە و پیادەکانی خۆت وەرە چونکە دوژمنان لەئێمە ترساون و ئەگەر هێزەکانی تۆ هاوکاریمان بکەن، هیواداریین سەرکەوتن بەدەست بێنین. سڵاو وماڵئاوا.

نامەکە لەفەلەستین بەدەستی ئەو گەیشت. ئەو چەند کەسەی کۆکردەوە و وتی: چی لەم نامەیەدا دەبینن؟

وتیان: بۆچونی ئێمە ئەوەیە لەشکر رەوانە بکەیت.

فەرمانی بەعەمرۆعاصدا بۆ رەوانە بون بەرەو میسر ئامادە ببێت. شەش هەزار پیاوی شەڕکەری کردە هاوڕێی و بەمێهرەبانی و خۆدورخستنەوە لەپەلە کردن فەرمانی پێدا. عەمرۆعاص بەرێکەوت و لەخوارەوەی میسر دابەزی و لایەنگرانی عوسمان پەیوەستی بون. ئەو لەناو ئەوان مایەوە و بۆ محەممەد کوڕی ئەبی بەکر نامەی نوسی: دوای سڵاو، گیانی خۆت رزگار کە و لەبەرابەر من خۆڕاگری مەکە چونکە حەز ناکەم لەمن زیانێك بەتۆ بگات لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەم شارە بۆ

ناسازگاری کردنی تۆ هاوپەیمانن و بەتەنیا جێت دەهێڵن. من لەچاکەخوازانی تۆم. لەگەڵ نێردراوەکە نامەی معاویەی بەهەمان ناوەڕۆك رەوانە کرد و ترساندی چونکە ئەویش ناهەنگی گەمارۆدانی عوسمانی کردبو.

محەممەد هەردو نامەکەی بۆ عەلی رەوانە کرد و ئاگاداری کردەوە عەمرۆعاص لەسەرزەمینی میسر دابەزیوە و ئەویش سستی و لاوازی لەهاورێکانی دەبینێت. داوای هاوکاری لەعەلی کرد. عەلی نامەی بۆ نوسی و پێی وت شوێنکەوتوانی خۆی کۆبکاتەوە ولەگەڵ ئەوان پەیمان ببەستێت. سەروەری باوەڕداران بەڵێنی رەوانە کردنی سوپای پێبەخشی و فەرمانی پێدا لەبەرابەر دوژمن خۆڕاگری بکات و شەڕیان لەگەڵدا بکات.

محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەناو خەڵك هەستا و داوای لێکرد لەژێر ئاڵاکەی کەنانە کوڕی بیشر بۆ شەڕی دوژمن بەرێکەون. دوهەزار پیاوی شەڕکەر ئامادەییان نیشاندا. محەممەد دوای ئەوە بەدوهەزار پیاوی شەڕکەر رۆشتەدەر و کەنانە فەرماندەی پێشەنگەکان بو. عەمرۆعاص روی لەکەنانە کرد. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، یەك یەك دەستە شەڕکەرەکانی رەوانە کرد. هەردەستەیەك روبەروی کەنانە بویەوە، شەڕی لەگەڵ کرد وبۆ لای عەمرۆعاص پاشەکشێی پێکرد. کاتێك عەمرۆ ئەمەی بینی، کوڕی حودەیجی بۆ لای معاویە رەوانە کرد و بەسوپایەکی گەورە هاتەوە و ئەوان کەنانە و هاورێکانیان گەمارۆدا. خەڵکانی شام لەهەر لایەکەوە هێرشیان کردنە سەر. کاتێك کەنانە ئەمەی بینی، لەئەسپەکەی دابەزی و هاوەڵانیشی دابەزین. تا ئەو کاتەی کوژرا، لەشەڕ کردن بەردەوام بو.

هەواڵی کوژرانەکەی بەمحەممەد کوڕی ئەبی بەکر گەشت. هاورێکانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد و عەمرۆ کوڕی عاص روی تێکرد. کەسی لەگەڵ نەمایەوە. محەممەد هاتەدەر و ملی رێگەی گرتەبەر. گەیشتە وێرانەیەکی قەراغ رێگا و پەنای بۆ برد. عەمرۆعاص بەرێکەوت تا گەیشتە ناو فوستات. معاویە کوڕی حودەیج بەدوای محەممەد کوڕی ئەبی بەکردا دەگەڕا و گەیشتە دەستەیەك لەقەراغ رێگا و پرسیاری ئەوی کرد. کەسێك وتی: رۆشتمە ئەو وێرانەیە وپیاوێکم بینی دانیشتوە.

کوڕی حودەیج وتی: خۆیەتی. رۆشتنە ناو وێرانەکە و هێنایانەدەر و بینیان

لەتینواندا خەریکە دەمرێت. ئەویان بەرەو فوستات برد.

براکەی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر کە لەسوپاکەی عەمرۆدا بو، ڕۆشتە لای عەمرۆ و وتی: ئایا دەتەوێت بەئەشکەنجە براکەم بکوژیت؟ کەسی بۆ لای کوڕی حودەیج رەوانە کرد و رێگەی ئەم کارەی لێگرت.

کوڕی حودەیج وتی: ئێوە خۆتان کەنانە کوڕی بیشرتان کوشت، من چۆن محەممەد بەرەڵا بکەم؟ ئایا ئاباوەران باشترن یا ئەمانە؟ ئایا ئێوە لەنوسراوی خوایی ئەمان نامەتان هەیە؟ (قمر/٤٣/٥٤). دورە دورە.

محەممەد کوڕی ئەبی بەکر وتی: ئاوم پێ بدەن.

معاویە کوڕی حودەیج وتی: خوا هەرگیز ئاوم پێ نەدات ئەگەر یەك دڵۆپ ئاو بەتۆ بدەم! ئێوە ئاوتان لەعوسمان گرتەوە. سوێند بەخوا دەتکوژم تا خواوەند ئاگری دۆزەخ و چڵکاوەکانی دەرخواردی تۆ بدات!

محەممەد پێی وت: ئەی حەرامزادەی حەرامزا، ئەم کارە لەدەستی تۆدا نیە، لەدەست خوادایە. ئەوبەهاورێکانی خۆی خواردنەوەیەکی فێنك دەبەخشێت و دوژمنانی وەك تۆ تینو دەهێڵێتەوە. سوێند بەخوا ئەگەر شمشێر لەدەستم دەبو، بوێری ئەم کارانەت نەدەبو.

کوڕی حودەیج پێی وت: دەزانی چی لەگەڵ تۆ دەکەم؟ تۆ دەکەمە ناو پێستی کەر و ئاگرت تێبەردەدەم.

محەممەد وتی: ئەگەر ئەم کارە لەگەڵ من دەکەن، زۆر دەمێکەیە لەگەڵ هاورێکانی خواوەند ئەو کارە دەکەن. هیوادارم خوا ئەوە لەسەر تۆ و هاورێکانت و کوڕی ئەبوسوفیان بکاتە ئاگر بەشێوەیەك هەر کاتێك روی لەکوژانەوە کرد، خوا ئاگرەکەی خۆشتر بکات.

کوڕی حودەیج تورە بو و ئەوی کوشت و جەستەی خستە ناو پێستی کەر و ئاگری تێبەردا.

کاتێك ئەم هەواڵە بەعایشە گەیشت، لەمەرگی براکەی گریا و شینی کرد و لەدوای نوێژ لەدەرگای خوا پاڕایەوە و دۆعای لەعەمرۆعاص و معاویە کرد و کەسانی بنەماڵەکەی محەممەدی گرتەخۆ کە لەناویان قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر

بو. عایشە دوای ئەوە تا کۆتایی ژیان گۆشتی برژاوی نەخوارد.

دەستەیەك دەڵێن: محەممەد لەگەڵ عەمرۆ و عاص و دارودەستەکەی شەڕی کرد تا کەنانە کوژرا و محەممەد شکەستی خوارد وخۆی لای جەبەلە کوڕی مەسروق شاردەوە. شوێنەکەیان بەمعاویە کوڕی حودمیج وت و ئەو گەمارۆیدا. محەممەد هاتەدەر و پیاوانە شەڕی کرد تا ئەو کاتەی کوژرا.

عەلی کاتێك نامەی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری پێگەیشت، وەڵامی دایەوە و مژدی پێبەخشی کەهێزی پشتیوانی بۆ رەوانە دەکات. دواتر لەناو خەڵك وتاریدا و لەچۆنیەتی کاروباری میسر ئاگاداری کردنەوە کەعەمرۆ عاص ئاهەنگی ئەو دیارەی کردوە. داوای لێکردن هاوکاری میسریەکان بکەن و بۆ شەڕ هانیدان و وتی: لەگەڵ ئێمە بەرەو جەرعە بەرێکەون. جەرعە ناوی شوێنێك لەنێوان کوفە تا حیرە بو. کاتێك بەیانی گەیشت، بەرەبەیانی زو رۆشتە جەرەعە و لەوێ دابەزی و تا نیمەڕۆ لەوێ مایەوە بەڵام کەس نەهات. گەڕایەوە. کاتێك ئێوارێ داهات، بەخەمباری سەرکردەکانی خەڵکی بانگ کرد و وتی: سوپاس بۆ خوا بۆ ئەوەی فەرمانەکەی رەوانە کرد و کارەکەی بەکۆتایی گەیاند و منی گرفتاری ئێوە کرد. ئەی شارستانێك، کاتێك فەرمان دەدەم، بەکاری نابەن و کاتێك داوا دەکەم، وەڵام نادەنەوە. ئایا کەسانێك لەئێوە بێ باوکتر هەیە! سەبارەت بەشارەکەی خۆتان و شەڕ بۆ پارێزگاری کردن لەماڵ خۆتان، چاوەڕوانی چی دەکەن؟ سوێند بەخوا ئەگەر مەرگ من بگرێتەوە، کاتێك بەسەر مندا زاڵ دەبێت کە لەهاورێیەتی ئێوە بێزار دەبم و بەبونی ئێوە سوپایەکی کەم ژمارەم لەبەردەستا دەبێت! خوا لەباوکتان خۆش بێت! ئایا دینێك لەئارادا نیە ئێوە لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە یا جموجۆڵێکی پیاوانە نیە ئێوە گەرم بکاتەوە. چی دەبینن کاتێك دوژمن بەردەوام سەرزەمینەکانی ئێوە کەم دەکاتەوە و بەردەوام هێرش دەکاتە سەرتان! ئایا جێگەی سەرسوڕمان نیە معاویە داوا لەبێ باوك و بێ سەر وپێکان دەکات و ئەوان بێ چاوەڕوانی کردنی پاداشت یەك جار و دوجار و سێ جار لەساڵدا وەڵامی دەدەنەوە و بۆ هەر شوێنێك بیەوێت رەوانەیان دەکات لەکاتێدا من ئێوە کەفەرمزانەکان و پاشماوەی چاکەکارانن، بەمژدەی پاداشت کۆدەکەمەوە و ئێوە لەدەوری من بڵاوەی لێدەکەن و نافەرمانی من دەکەن و ناسازگاری دەگرنەبەر.

کەعب کوڕی مالکی ئەرحەبی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵك کۆبکەرەوە چونکە خۆم بۆ ئەم ڕۆژە هەڵگرتوە. دواتر وتی: ئەی خەڵکینە، لەخوا بترسن و بانگەوازی ڕێبەرەکەتان وەڵام بدەنەوە و بۆ شەڕی دوژمن بەرێکەون. من ئێستا لەگەڵ ئەو بەرێدەکەوم. دوهەزار پیاوی شەڕکەر لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. پێی وت: ئەوان هەڵگرە و بەرێکەون بەڵام سوێند بەخوا گومان ناکەم بەوان بگەیت مەگەر ئەوەی ڕۆژگارێك بەسەر چوبێت و کار لەکار ترازابێت. ئەو لەگەڵ پێنج هەزار شەڕکەر بەرێکەوت.

لەم کاتەدا حەجاج کوڕی غەزیەی ئەنساری لەمیسرەوە گەیشت و هەواڵی کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و هاورێکانی هێنا. دوبارە عەبدولرەحمان کوڕی شەبیبی فەزاری لەشامەوە هات. ئەو ئاگاداری کردنەوە کە لەلایەن عەمرۆعاص هەواڵی کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و داگیری کردنی میسر بەمعاویە گەیشتوە و خەڵکانی شام لەکوژرانی ئەو شادمانی دەکەن.

عەلی وتی: ئەی هاوار! خەمی ئێوە لەکوژرانی ئەو بەئەندازەی شادمانی ئەوان لەمەرگی ئەوە، بەڵکو چەندین بەرابەر! عەلی کەسی ڕەوانە کرد تا سوپاکە بگەڕێنێتەوە و لەناو خەڵك وتاریدا و وتی:

ئاگادار بن خراپەکاران و ستەمکاران و ئەو گوناحکارانەی بەردەوام خەڵکیان لەڕێگەی خوا دور دەخستەوە و دینیان بەلارێدا دەبرد، دەستیان بەسەر میسردا گرت. ئاگادار بن محەممەد کوڕی ئەبی بەکر کوژرا. ئەو لەریزی بەهەشتیەکان هەژمار دەکەین. سوێند بەخوا ئەو بەهەمان شێوە کەدەمناسی، چاوەڕوانی چارەنوسی دەکرد و تەنیا بۆ پاداشتی خوایی تێدەکۆشا و لەروخساری گوناحکار بێزار بو و ڕێنمای باوەڕداری وەسف دەکرد. سوێند بەخوا خۆم سەرکۆنە ناکەم چونکە کەمتەرخەمیم لەکاروباری ئەو نەکرد. من بەردەوام گرفتار و گیرۆدەی شەڕەکان بوم و لەم بوارەدا شارەزایی تەواوم هەیە. من پێشوازی لەکارەکان دەکەم وڕێگەی دورئەندێشی بەباشی دەناسم و لەنێوان ئێوە بەبۆچونێکی ڕاست و ئاشکرا بەکار هەڵدەستم و بەئاشکرا هاوار دەکەم و هاوشێوەی دادخوازەکان داوای هاوکاریتان لێ دەکەم بەڵام گوێ لەقسەی من ناگرن و فەرمانی من بەکار نابەن تا کارەکانی من بەئەنجامێکی زیانبەخش

بگەیێنن. سوێند بەخوا بەهاوکاری ئێوە ناتوانم داوای خوێنێك بکەم و تۆڵەیەك بستێنمەوە. پەنجا و چەند شەوی رابردو بەردەوام بۆ هاوکاری براکەتان هانمدان و ئێوە هاوشێوەی وشترە دەم کراوەکان بۆڵەبۆڵتان کرد و سەنگین خۆتان بەزەویەوە نوساند وەك بڵێی هیچ ئاهەنگێك بۆ شەڕ یا هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی خوایی نیە. دواتر سوپایەکی ورد و کەم لەنێوان ئێوە وەلامی دایەوە بەشێوەیەك ڕەنگ پەڕاو وەك بڵێی بۆ دۆڵی مەرگیان دەبەن و مەرگ بەچاوی خۆیان دەبینن. تف لەئێوە! دواتر دابەزی.

## ڕەوانە کردنی عەبدالله کوڕی حەزرەمی

## لەلایەن معاویەوە بۆ بەسرە

لەم ساڵەدا دوای کوژرانی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و زاڵبونی عەمرۆ عاص بەسەر میسر، معاویە عەبدالله کوڕی حەزرەمی ڕەوانەی بەسرە کرد و پێی وت: زۆربەی خەڵك سەبارەت بەعوسمان باوەڕی ئێمەیان هەیە چونکە لەرێگەی تۆڵەسەندنەوەی ئەو کوشتار کران. لەبەر ئەمە ئەوان تۆڵەستێنن و چاوەڕوانی کەسێکن بڕوات و ئەوان بۆ تۆڵەسەندنەوەی ڕێبەرەکەیان کۆبکاتەوە. لەناو موزێر دابەزە و لەگەڵ ئەزدیەکان ڕێگەی ئاشتی بگرەبەر چونکە ئەوانە هاورێیەتی تۆ دەکەن. خەڵکی ڕەبیعە بانگ بکە چونکە جگە لەوان کەس دوری لەتۆ ناکات لەبەر ئەوەی هەمویان شوێنکەوتەیی عەلین. لەوان خۆت بەدور بگرە.

کوڕی حەزرەمی بەرێکەوت تا گەیشتە بەسرە. فەرمانڕەواکەی عەبدالله کوڕی عەباس ڕۆشتبوە کوفە بۆ لای عەلی و زیاد کوڕی ئوبیەی لەجێگای خۆی دانابو. کاتێك کوڕی حەزرەمی گەیشتە بەسرە، لەنێوان بەنی تەمیم دابەزی و لایەنگرانی عوسمان لەدەوری کۆبونەوە و سلاویان بۆ نارد و کەسانی دیکەیش بەهەمان شێوە دەوریان گرت. قسەی بۆ کردن و وتی: ڕێبەری ئێوە، ڕێبەری ڕاستی و دروستی ڕزگاری، بەستەم کوژرا. عەلی ئەوی کوشت و ئێوە داوای خوێنی ئەو دەکەن. خوا باشترین پاداشتان بداتەوە.

زوحاك كوڕی قەسی هیلالی، فەرماندەی پاسەوانەكانی كوڕی عەباس هەستا و وتی: خوا فێزمون بكات ئەوەی بۆ ئێمەت هێناوە و ئەوەی بانگەوازی بۆ دەكەیت. سوێند بەخوا داوای كارێكی هاوشێوەی كارەكەی تەڵحە و زوبەیر دەكەیت. ئەم دوانە لەكاتێدا هاتنە لای ئێمە كە لەگەڵ عەلی بەیعەتمان كردبو و كاروبارمان بەهێز و سەقامگیر. بلاوەیان بەئێمە كرد تا یەكترمان كوشتار كرد. ئێستا بەیعەتمان لەگەڵ ئەو بەهێزە. ئەو لەهەڵەكان خۆش و گوناحكارەكانی بەخشیوە. ئایا فەرمانمان پێدەدەیت شمشێرەكانمان دەركێشین و یەكتر كوشتار بكەین تا معاویە سەردار و سەروەر بێت؟ سوێند بەخوا ڕۆژێك لەڕۆژەكانی عەلی باشتر لەهەمو ڕۆژگاری معاویە و بنەماڵەی ئەوە.

عەبداللە كوڕی خازمی سەلەمی هەستا و ڕوی كردە زوحام و پێی وت: بێدەنگ بە چونكە تۆ شیاوی گفتوگۆ نیت. دواتر ڕوی كردە كوڕی حەزرەمی و وتی: ئێمە هاوڕێ و بازوی تۆین و قسەی ڕاست ئەوەیە تۆ بیهێنیتە سەر زمان و تەنیا شوێن وتەكانی تۆ دەكەوین. نامەكەت بخوێنەرەوە.

ئەو نامەی معاویەی دەرهێنا. معاویە لەنامەكەی خۆی ئاماژەی بەچاكەكاریەكانی عوسماندابو كەتەندروستی و چاكسازی و ئارامی خۆش دەویست وسنورەكانی دەپاراست و ئالای ئارامی وئاسایشی تیا هەڵدەكرد. دواتر معاویە كوژرانی عوسمانی بیرخستنەوە و داوای تۆڵەسەندنەوەی لەوان دەكرد و بەڵێنی دەدا ئەگەر بێتە سەر كار، وەك شێوازی پێغەمبەر هەڵس و كەوتیان لەگەڵ بكات و ساڵی دوجار بەخشینەكانی خۆی بەوان ببەخشێت. كاتێك لەخوێندنەوە تەواو بو، ئەحنەف كوڕی قەیس هەستا و وتی: من لەم كارەدا نە وشترێكی مێچكەم هەیە نەوشترێكی نێر. ئەو خۆی لەوان دور خستەوە.

عەمر كوڕی مەرحومی عەبدی هەستا و وتی: لەسەر فەرمانبەری خۆتان بەهێز بن و خۆڕاگری بكەن وبەیعەتەكەی خۆتان مەشكێنن چونكە ئاژاوە ئێوە دەگرێتەوە.

عەباس كوڕی صوحاری عەبدی دوژمنایەتی لەگەڵ عەلی دەكرد و لەگەڵ خەڵكەكەی خۆی ڕێگەی ناسازگاری دەگرتەبەر. هەستا و وتی: بێ گومان بەدەست و بەزمانی خۆمان هاوكاریت دەكەین.

موسەنا کوڕی موخەربەی عەبدی وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بۆ شوێنی یەکەمی خۆت نەگەڕێیتەوە، بەشمشێر و ڕم شەڕی تۆ دەکەین. ئاگادار بە وتەی ئەم پیاوە (عەباس کوڕی صوحار) فریوت نەدات.

کوڕی حەزرەمی بەصەبرە کوڕی شیبانی وت: تۆ گەورەیەك لەگەورەکانی عەرەبیت، هاوکاریم بکە. وتی: ئەگەر لەماڵەکەی من دابەزیت، هاوکاریت دەکەم.

کاتێك زیاد کوڕی ئوبەییە ئەمەی بینی، ترسا و حوزەین کوڕی مونزەر و مالك کوڕی مێسمەعی بانگ کرد و بەوانی وت: ئەی خەڵکی بەکر کوڕی وایل، ئێوە هاوڕێیانی سەروەری باوەڕداران و پشتیوانەکانی ئەون. کوڕی حەزرەمی بەو کارانەوە سەرقاڵە کەدەبیینن و کەسانێك لەدەوری ئەو کۆبونەتەوە دەیانناسن. بمپارێزن تا فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالب بگات.

حوزەین کوڕی مونزەر وتی: ئەو کارە دەکەم.

مالك کوڕی مێسمەع کە بەدڵ و ئەندێشە لەگەڵ ئومەوییەکان بو، وتی: ئەمە کارێکە من دەبێت لەگەڵ چەندین کەس راوێژ بکەم و دواتر لێکۆڵینەوە بکەم تا چ کارێك بکەم.

کاتێك زیاد دودڵی مالکی بینی، ترسا خەڵکی رەبیعە لەفەرمانبردنی ئەو دودڵی لەخۆیان نیشان بدەن و ڕێگەی ناسازگاری بگرنە بەر. کەسی بۆ لای صەبرە کوڕی شەیمانی حودانی ئەزدی رەوانە کرد و داوای لێکرد خۆی و گەنجینە موسوڵمانان پەنا بدات و بیپارێزێت.

صەبرە وتی: ئەگەر بیهێنیتە ماڵەکەی من دەیپارێزم. ئەوگەنجینەی بۆ ماڵی صەبرە لەحودان برد. تەختی وتاردانی بۆ ئەوێ گواستەوە. زیاد کوڕی ئوبەییە نوێژی هەینی لەمزگەوتی حودان خوێند ولەوێ خەڵکی بۆ میوانی بانگێشت دەکرد و خواردنی دەرخوارد دەدان. دواتر زیاد بەجابر کوڕی وەهبی راسبی وت: ئەی باوکی محەممەد گومان ناکەم کوڕی حەزرەمی دەستبەرداری ئێمە ببێت و دەبینم بەزویی شەڕ لەگەڵ ئێوە دەست پێدەکات بەڵا نازانم خەڵکی تۆ ئاهەنگی چ کارێکیان هەیە و پشتیوانی لەکێ دەکەن. بزانە باوەڕ و بۆچونی ئەوان چیە. کاتێك زیاد نوێژی خوێند، لەمزگەوت دانیشت و خەڵك لەدەوری کۆبونەوە. جابر وتی: ئەی خەڵکی ئەزد،

تەمیمیەکان گومان دەکەن ئەوان کۆڵەکەی بنچینەیی خەڵك و لەشەڕ لەئێوە خۆڕاگرترن. هەواڵ بەمن گەیشتوە دمیانەوێت بەرەو لای ئێوە بەرێبکەون و پەنابەرەکەی ئێوە بگرن و بەزۆر بیبەنەدەر. ئەگەر ئەم کارە بکەن، ئێوە چی دەکەن کەپەناتان بەو و گەنجینەی موسوڵمانان داوە؟

صەبرە کوڕی شەیمان وتی: ئەگەر ئەحنەف بێت، من دێم ونەگەر پشتیوانەکانی ئەوان بگەن، خۆڕاگری دەکەم و ئەگەر گەنجەکانیان بکەن، ئێمەیش گەنجمان هەیە.

زیاد کوڕی ئوبیە ئەم هەواڵەی بۆ عەلی نوسی. عەلی ئەعیەن کوڕی زەبیعەی موجاشعی تەمیمی بۆ لای ئەو رەوانە کرد تا خەڵك لەدەوری کوڕی حەزرەمی بلاوە پێبکات وئەگەر ئەوان نافەرمانی بکەن و سەنگەر بگرن لەگەڵ فەرمانبەرانی خۆی لەگەڵ نافەرمانان شەڕ بکات. نامەی بۆ زیاد نوسی و لەم فەرمانە ئاگاداری کردەوە. ئەعیەن هات و ڕۆشتە لای زیاد و لای ئەو مایەوە. ئەو خەڵکانی کۆکردەوە و ڕۆشتە لای خەڵکەکەی خۆی و ئاهەنگی کوڕی حەزرەمی کرد و داوای فەرمانبردنی لێکردن.ئەوان جنێویان پێدا. ئەعیەن تەواوی رۆژ لەگەڵ ئەوان مشتومڕی کرد و دواتر گەڕایەوە. خەڵکەکەی لەدەوری کۆبونەوە. دەوترا ئەوان لەخەواریج بون و دەوترا کوڕی حەزرەمی ئەوانی بۆ کوشتنی ئەو راسپاردبو. کوڕی حەزرەمی لەناو ئەواندا دەژیا. ئەوان بەشێوەیەکی لەناکاو ئەویان کوشت. کاتێك ئەعیەن کوژرا، زیاد ئاهەنگی شەڕی ئەوانی کرد.

تەمیمیەکان پەیامیان بۆ ئەزدیەکان نارد: ئێمە ئاهەنگی پەنابەرەکەی ئێوەمان نەکردوە، ئێوە دەتانەوێت چی لەپەنابەرەکەی ئێمە بکەن؟

ئەزدیەکان شەڕکردن لەگەڵ ئەوانیان بەناخۆش دەزانی و وتیان: ئەگەر ئاهەنگی پەنابەرەکەی ئێمە بکەن، دەیپارێزین.

زیاد نامەی بۆ عەلی نوسی و لەم روداوە ئاگاداری کردەوە. عەلی جاریە کوڕی قودامەی سەعدی لەبەنی سەعد کوڕی بەنی تەمیم هاوڕێ لەگەڵ پەنجا یا پێنسەد پیاوی شەڕکەر لەتەمیمیەکان رەوانە کرد و نامەی بۆ زیاد نوسی و فەرمانی پێدا هاوکاری جاریە و رێنوێنی پێویستی پێ بکات. جاریە گەیشتە بەسرە و زیاد ئاگاداری کردەوە چی بەسەر ئەعیەن هاتوە. جاریە لەنێوان ئەزدیەکان هەستا و داوای پاداشتی

خوایی بۆ کردن و وتی: ئێوە ئەو کاتەی راستی و دروستیان ناسی کەکەسانیتر لەناسینی خۆیان بەدور دەگرت. ئەو نامەی عەلی بۆ خەڵکی بەسرە خوێندەوە. عەلی لەنامەکەی خۆی سەرکۆنەی خەڵکانی بەسرە دەکرد و لەسزادان دەیترساندن و بەتوندی لەگەڵ ئەوان قسەی دەکرد و لەمزدەکەی خۆی رێگەی کوشتن و تۆقاندنی دەدا کە بۆشەڕی ئەوان بەرێدەکەوێت و بەشێوەیەك ئەوان کوشتار دەکات نەتوانرێت شەڕی وشتری پێ بەراوەرد بکرێت.

صەبرە کوڕی شەیمان وتی: بیسەری فەرمانی سەروەری باوەڕداران و فەرمانبەری ئەوین. ئەو کەسەی ئاشتی لەگەڵ ئەو بکات، ئاشتی لەگەڵ دەکەین و ئەو کەسەی دژایەتی ئەو بکات، شەڕی لەگەڵ دەکەین.

ئەبوصەفرە باوکی مەهلەب بەزیاد کوڕی ئوبیەی وت: ئەگەر لەرۆژی وشتر ئامادە دەبوم، هیچ کەس لەخەڵکانی من دژایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالبی نەدەکرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەبو صەفرە پێش شەڕی صەفین مرد. و خوا زاناترە.

جاریە بەرەو لای خەڵکەکەی خۆی بەرێکەوت و نامەی عەلی بۆ ئەوان خوێندەوە و مژدەی چاکەی پێ بەخشین. زۆرینەی ئەوان وەڵامیان دایەوە و بەپێشنیارەکەی رازی بون. ئەو هاورێ لەگەڵ ئەزدیەکان و شوێنکەوتوانی خۆی لەخەڵکەکەی ئاهەنگی کوڕی حەزرەمی کرد. ئەوان ماوەیەك شەڕیان کرد. شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی هات و هاوکاری جاریەی کرد. کوڕی حەزرەمی شکەستی خوارد و هاورێ لەگەڵ کوڕی خازم روی لەکۆشکی سەنبیل کرد و لەوێ سەنگەری بەست. دایکی عەجلی کەژنێکی حەبەشی ئەژاد بو، هات و بۆ دابەزین فەرمانی پێدا. ئەو رازی ئەبو. دایکی وتی: سوێند بەخوا یا دادەبەزیت یا جلەکانی خۆم لەبەر دادەکەنم. ئەو دابەزی و هەڵات و رزگاری بو. جاریە کۆشك و کۆشکنشینەکانی سوتاند. کوڕی حەزرەمی و حەفتا پیاوی هاورێی لەناوچون. زیاد بۆ کۆشکەکەی گەڕایەوە. کۆشکی سەنبیل لەکۆنەوە شوێنی نیشتەجێ بونی ئێرانیەکان بو ودواتر بە سەنبیلی سەعدی گەیشت. لەناو ئەو کەسانەی سوتان: یەکیان دەراع کوڕی بەدر برای حارسە کوڕی بەدر بو. عەمرۆ کوڕی عەرەندس لەمبارە وتی:

ردنا زیادا الی دارە و جار تمیم دخانا ذهب

| | |
|---|---|
| لحى الله قوما شووا جارهم | و لم يدفعوا عنه حر اللهب |

یانی: زیادمان بۆ ماڵەکەی گەڕاندەوە و پەنابەری خەڵکی تەمیم بو بەدوکەڵ و لەناوچو. خوا ریسوا بکات ئەو خەڵکەی پەنابەرەکەی خۆیان برژاند و بڵێسەکانی ئاگریان لەو دور نەخستەوە.

ئەم قەسیدەیە دێری دیکەیشی هەیە. جەریر وتی:

| | |
|---|---|
| غدرتم بالزبير فما و فيتم | و فاء الازد منعوا زيادا |
| فاصبح جارهم بنجاة عز | و جار كجاشع امسى رمادا |
| فلو عاقدت حبل ابى سعيد | لذاد القوم ما حمل النجادا |
| و ادنى الخيل من رهج المنايا | و اغشاها الا سنة و الصعادا |

یانی: لەگەڵ زوبەیر دەغەڵکاریتان کرد و رێزتان لەپەیمانەکەی خۆتان نەگرت بەڵام ئەزدیەکان رێزیان لەپەیمانەکەی خۆیان گرت لەگەڵ زیاد و پاراستیان. پەنابەری ئەوان رزگاری بو و رێزداری پێ بەخشرا و پەنابەری موجاشیع بو بەخۆڵەمێش. ئەگەر بەتەنافەکەی ئەبی سەعید خۆت هەڵدەواسی، تا دوایین سات کەبەندی شمشێر لەکەمەریدا بو، بەرگری لەگەڵ خەڵك دەکرد، ئەسپەکانی بۆ گۆڕەپان غاردا و دەوری گۆڕەپانی هان دەدا و بەرمەکان و فریوەکان دایدەپۆشاند.

## داستانی خێریت کوڕی راشد و بەنی ناجیە

دەڵێن: لەم ساڵەدا خێریت کوڕی راشدی ناجی، رێگەی ناسازگاری لەگەڵ عەلی گرتەبەر. ئەو هاورێ لەگەڵ سێسەد کەس لەبەنی ناجیە کە لەگەڵ عەلی لەبەسرە هاتبونەدەر و بەشداری شەڕی وشتر و صەففینیان کردبو و تا ئەم کاتە لای ئەو لەکوفە مابونەوە، هاتەدەر و لەگەڵ سی سوار رۆشتە لای عەلی و وتی: ئەی عەلی، سوێند بەخوا لەتۆ فەرمان نابەم و لەپشت سەری تۆ نوێژ ناخوێنم و بەیانی خۆم لەتۆ دوردەخەمەوە. ئەم کارە دوای بەسەرهاتی داوەرکان بو.

عەلی پێی وت: دایکت لەپرسەکەتا دانیشێت! ئەگەر ئەم کارە بکەیت، نافەرمانی پەروەردگار دەکەیت و پەیمانی خۆت دەشکێنیت و جگە لەخۆت زیان بەکەس ناگەیێنیت. ئاگادارم بکەرەوە بۆ ئەم کارە دەکەیت؟

وتی: لەبەر ئەوەی داوەرت هەڵبژارد ولەرێگەی راستی و دروستی سستی و لاوازیت لەخۆت نیشاندا و پەنای ستەمکارانت دا. من لەتۆ تورەم و رقی تۆم لەدڵدایە و لەهەموتان دورم..

عەلی پێی وت: وەر تا لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند وشێوازی پێغەمبەر گفتوگۆت لەگەڵ بکەم و ئەو قسانەت بۆ باس بکەم کە لەتۆ ئاگادارترم لێیان تا ئەوەی ئێستا پەسەندی ناکەیت، بناسیت.

وتی: بۆ لای تۆ دەگەرێمەوە.

عەلی وتی: ئاگاداربە دێو فریوت نەدات و نەزانەکان فێڵت لێ نەکەن. سوێند بەخوا ئەگەر داوای رێنوێنی لەمن بکەیت و بەوتەکانی من رازی بیت، بێ گومان بۆ رێگەی راست رێنوێنیت دەکەم.

ئەو لای عەلی رۆشتەدەر و بۆ لای کەسەکانی خۆی گەرایەوە و هەمان شەو لەگەڵ هاورێکانی بەرێکەوت. کاتێك عەلی لەرۆشتنی ئەوان ئاگادار بویەوە، وتی: ون ببن لەناو بچن ئەو خەڵکانەی وەك خەڵکی سەمود لەناوچون! شەیتان ئەمرۆ فریویدان و گومرایی کردن و بەیانی بێزاری خۆی لەوان دەردەبرێت. زیاد کورِی خەصەفەی بەکری پێی وت: ئەی سەروەری باوەرداران، بونی ئەوان بۆ ئێمە گرنگ نەبو تا لەنەبونیان خەم بخۆیت. ئەگەر دەمانەوە، ژمارەیەکی کەمیان بەئێمە زیاد دەکرد و ئەمرۆ کە رۆشتنەدەر، ژمارەیەکی کەمیان لەئێمە کەم کردەوە، بەلاّم دەترسم دەستەیەکی گەورە لەهاتوان بۆ لای تۆ گومرا بکەن و لەئێمەیان بتارێنن. فەرمانێك بەمن بدە شوێنیان کەوم وبیانگێرمەوە.

عەلی پرسی: ئایا دەزانی رویان لەکوێ کردوە؟

وتی: نە، بەلاّم دەپرسم و بەشوێن پێکاندا دەرۆم.

عەلی وتی: خوا لێت خۆش بێت، برۆ و لەدێری ئەبوموسا دابەزی و بمێنەرەوە تا فەرمانی من بەتۆ بگات چونکە ئەگەر ئەوان دەربکەونت، کارگوزارەکانم ئاگادارم دەکەنەوە.

زیاد رۆشتەدەر وبۆ ماڵ گەرایەوە و هاورێیانی خۆی لەبەکر کورِی وایل کۆکردەوە وئەوانی ئاگادار کردەوە. سەد وسی پیاوی شەرکەر لەگەڵ بەرێکەوتن. وتی: من بەسە.

دواتر بەرێکەوت تا گەشتە دێری ئەبوموسا و ڕۆژێك لەوێ مایەوە و چاوەڕوانی فەرمانی عەلی کرد. بۆ نعەلی نامەیەك لەقەرەزەی کوڕی کەعبی ئەنساری هات و هەواڵیدا ئەوانی رویان لەنێفر کردوە وخەڵکی پیاوێکی موسوڵمانیان کوشتوە. عەلی کەسی بۆ لای زیاد کوڕی ئوبەییە نارد و فەرمانی پێدا شوێن ئەوان بکەوێت. لەمەبەستی ئەوان ئاگاداری کردەوە و پێی وت کەپیاوێکی موسوڵمانیان کوشتوە. فەرمانی پێدا بیانگەڕێنێتەوە و ئەگەر رازی نەبون شەڕیان لەگەڵ بکات. نامەکەی بەعەبداللە کوڕی وال رەوانە کرد. عەبداللە داوای فەرمانی لێکرد تا لەگەڵ زیاد بەرێکەوێت. عەلی فەرمانی پێدا و پێی وت: هیوادرام لەهاورێکانم لەرێگەی راستی و دروستی و پشتیوانەکانم لەبەرابەر ستەمکاران بیت.

کوڕی وال دەڵێت: سوێند بەخوا ئەم وتارەی عەلی کوڕی ئەبی تالب لەهەمو وشتره مو سورەکان بۆ من بەهادارتر بو.

ئەو نامەکەی عەلی بۆ زیاد برد. ئەوان بەرێکەوتن تا لەنێفر دابەزین. وتراو ئەوان بەرەو جەرجەربا بەرێکەوتن. شوێنیان کەوتن و لەمەزار پێیان گەیشتن. خراپەخوازان لەوێ دابەزیبون وشەو وڕۆژی خۆیان بەئارامی بەسەر بردبو. زیاد کاتێك گەیشت هاورێکانی شەکەت و ماندو ببون. کاتێك ئەوانیان بینی، سوار ئەسپەکانی خۆیان بون و خێریت بەوانی وت: چیتان دەوێت؟

زیاد کەپیاوێکی ئارام و بەئەزمون بو، وتی: هیلاکی ئێمە نابینیت. ئەوەی بۆی هاتوین، وتارێکی ئاشکرای ناوێت. دادەبزین و هەموان گفتوگۆ دەکەین. ئەگەر ئەوەی ئێمەی باسی دەکەین، لەبەرژەوەندی تۆدا بو و بەبەختی خۆتت لەقەڵەمدا، پێی رازی دەبیت وئەگەر ئێمە لەناو قسەکانی تۆ، شتێکی باشە و هۆکاری تەندروستیمان بینی، پێی رازی دەبین.

خێریت وتی: ئەگەر بەم شێوەیە، دابەزە.

زیاد و هاورێکانی لەوێ لەسەر ئاوێك دابەزین و خواردیان و تورەکەیان بۆ چوارپێکانی خۆیان هەڵبەست. زیاد لەگەڵ پێنج سوار لەناو هاورێکانی خۆی، لای ئەوان وەستا. ئەوانیش هاتن. زیاد وتی: ژمارەمان بەئەندازەی ئەوانە. ئێوە لەناو دودەستەی شەڕکەر ناتەوانەکەیان مەبن.

زیاد بەرەو لای خێریت بەرێکەوت و بیستی ئەو و هاورێکانی بەیەکتر دەڵێن: ئەم خەڵکە ناڵان و هیلاك گەیشتنە لای ئێمە و ئێمە بەرەلامان کردن تا ئاسودە ببن و بحەوێنەوە. سوێند بەخوا ئەمەنەزانیە. زیاد بانگی کرد وپێی وت: چ کارێك بەناڕەوا بینی کەبوە هۆکاری تورە بونت لەسەرومری باوەڕداران و خۆت لەئێمە دور خستەوە؟

خێریت وتی: بەسەرومری سەروەری ئێوە رازی نەبوم و هەڵس و کەوتی ئێوەم پەسەند نەکرد و لەبەر ئەمە بڕیارمدا دورەپەرێزی و گۆشەگیری هەڵبژێرم و پەیوەستی ئەو کەسانە ببم کەدەیانەوێت بەراوێژی گشتی فەرمانڕوایی موسوڵمانان هەڵبژێرن.

زیاد پێی وت: ئایا گومانی ئەوە هەیە خەڵك بتوانن لەدەوری سەرۆکێکی لەم شێوە کۆببنەوە کە خۆت لەو دورخستۆتەوە؟ ئایا لەروانگەی زانست و شێوازی ئەو و نوسراوی ئەو هاورێ لەگەڵ نزیکی لەگەڵ پێغەمبەر و بەم پێشینە درەوشاوەیە لەئیسلام، کەس دەتوانێت بەرابەری بکات.

خێریت وتی: ئەمە بەتۆ ناڵێم.

زیاد پێی وت: لەبەر چی ئەو پیاوە موسوڵمانەت کوشت؟

خێریت وتی: من نەمکوشت بەڵکو دەستەیەك لەهاورێکانم ئەو کارەیان کرد.

زیاد وتی: ئەوان بەئێمە بسپێرە.

خێریت وتی: هەرگیز.

زیاد هاورێکانی خۆی بانگ کرد وخێریتیش بەهەمان شێوە. شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد بەشێوەیەك سەرەتا بەڕم لەیەکیان دەدا تا ڕمەکان شکان و دواتر شمشێریان دەرکێشا تا خوار بون و زۆربەی چوارپێکانیان لەناوچونو برینداراەکانیان روی لەزیاد بون کرد. لەهاورێکانی زیاد دو کەس و لەهاورێکانی خێریت پێنج کەس کوژران. دواتر تاریکی شەو جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد و سوپاییەکان لەیەك بێزار بون. زیاد بریندار بو.

خێریت شەوانە لەوێ ڕۆشت و زیاد بۆ بەسرە گەڕایەوە. هەواڵی خێریتیان پێگەیشت کەڕۆشتۆتە ئەهواز و لەسوچێکدا دابەزیوە و کەسانێك لەخەواریج پەیوەستی بون تا ئەو جێگەی ژمارەیان بۆ دوسەد کەس زیادی کردوە. زیاد ئەم

هەواڵەی بۆ عەلی نوسی و وتی لەشاردا ماوەتەوە و تیماری بریندارەکان دەکات و چاوەڕوانی فەرمانی ئەوە.

کاتێك عەلی نامەکەی خوێندەوە، مەعقەل کوڕی قەیس هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران شیاوبو زیاد لەبەرابەر یەك کەسی ئەوان دەکەسی لەگەڵدا بێت تا کاتێك روبەرویان دەبێتەوە، بەتەواوی لەناویان ببات. بەڵام ئەگەر دەستەیەك بەئەندازەی خۆیان روبەرویان ببێتەوە، سوێند بەگیانی خۆم لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری دەکەن چونکە دوسوپا کەژمارەیان بەیەك ئەندازە بێت، لەبەرابەر یەکتر خۆڕاگری دەکەن.

عەلی وتی: ئەی مەعقەل، باروبنە و ساز وبەرگی پێویست هەڵبگرە و خۆت ئامادە شەڕ بکە و بەرەو لای ئەوان بەرێکەوە. دو هەزار پیاوی شەڕکەر لەکوفە لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن کەیەزید کوڕی مەعقەلی ئەسەدی لەناویاندا دەبینرا. عەلی نامەی بۆ کوڕی عەباس نوسی و فەرمانی پێدا پیاوێکی بوێر و خۆشناو و ناسراو بەچاکەکاری و راست کرداری هاوڕێ لەگەڵ دوهەزار شەڕکەری بەهێز بۆ لای مەعقەل کوڕی قەیس رەوانە بکات تا خۆی بەو دەگەیێنێت و دواتر مەعقەل فەرماندەیی لەدەست بگرێت. بۆ زیاد کوڕی خەصەفە نامەی نوسی و سوپاسی کرد و فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە.

لەدەروی خێریت کوڕی راشدی ناجی دەستەیەکی فراوان لەخەڵکانی یاخی و شەڕکەر و چارەخواز لەئەهواز کۆبونەوە و دەیانویست قورسایی باج لەسەر شانی خەۆیان هەڵبگرن. هەروەها دەستەیەك لەچەتە و رێگرەکانی عەرەبی هاوباوەڕی خۆی لەدەوری کۆبونەوە. باجدەران هیوایان دەخواست باجەکانیان وەربگرنە و سەهل کوڕی حەنیفیان لەفارس دەرکرد. ئەو فەرمانڕەوایی عەلی لەم شارەبو. ئەمە لەسەر بنەمایی گێڕانەوەی کەسێکە گومان دەکات ئەو لەساڵی ٦٥٧/٣٧—٦٥٨ زایینی ئەمردوە. کوڕی عەباس بەعەلی وت: من کاروباری فارس لەبەرژەوەندی تۆ کۆتایی پێدێنم وئەم کارە لەسەر دەستی زیاد کوڕی ئوبەییە ئەنجام دەدەم.

عەلی فەرمانی پێدا زیاد بۆ ئەو سەرزەمینە رەوانە بکات ولەم کارەدا بەپەلە بێت. ئەو زیادی لەگەڵ سوپایەکی فراوان بۆ ئەو دیارە رەوانە کرد و سەرزەمینەکانی فارسی ملکەچ کرد و خەڵك باجی خۆیان دا.

مەعقەل کوڕی قەیس بەرێکەوت و عەلی پێشنیاری پێکرد و فەرمووی: تا ئەو شوێنەی دەتوانی، لەخوا بترسە و ستەم لەموسوڵمانان مەکە و ئەمان دراوەکان ئازار مەدە ورێگەی یاخیبون و ستەمکاری مەگرەبەر چونکە خواوەند یاخیبوانی خۆش ناوێت.

مەعقەل ڕۆشتە ناو ئەهواز و چاوەڕوانی گەیشتنی هێزەکانی بەسرەی دەکرد. هێزەکان دواکەوتن و ئەو لەئەهواز هاتەدەر وبەدوای خێریت گەڕا. ڕۆژێك زیاتر ڕێگەی نەبڕی کەهێزە پشتیوانەکان هاورێ لەگەڵ خالید کوڕی مەعدانی تایی پەیوەستی بون. هەموویان بەرێکەوتن ولەنزیك کێوی رامهورموز روبەرویان بونەوە. مەعقەل هاورێکانی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و یەزید کوڕی مەعقەلی کردە فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی خۆی و مێنجاب کوڕی راشدی زەببی لەخەڵکی بەسرە کردە فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی. خێریتیش ریزەکانی خۆی کۆکردەوە و عەرەبەکانی لەباڵی راست جێگیر کرد و هاودەست و یاخیبوانی شارەکانی لەباڵی چەپ. کوردەکان لەگەڵ ئەواندا بون. هەرکام لەوان هاورێکانی خۆی بۆ شەڕێکی بوێرانە هاندەدا مەعقەل دوجار سەری خۆی جوڵاند و لەجاری سێیەم هێرشی دەستپێکرد. ئەوان ماوەیەك خۆڕاگریان کرد و سەرئەنجام شکەستیان خوارد. هاورێکانی مەعقەل حەفتا پیاویان لەوان کوشت کە لەهاورێکانی عەرەبی ئەوان و لەبەنی ناجیە بون. نزیکەی سێسەد کەس لەیاخیبوان و کوردەکانیان کوشتار کرد. خێریت کوڕی راشد شکەستی خوارد و پەنای بۆ کەنارەکانی دەریا برد چونکە لەوێ کەسانێکی فراوان لەخەڵکەکەی نیشتەجێ بون. ئەو بەردەوام لەناو ئەوان دەسوڕا و بۆ ناسازگاری لەگەڵ عەلی هانی دەدان و پێی دەوتن رزگاری لەدژایەتی کردنی عەلیدایە. ئەوەندە ئەم کارەی کرد تا شوێنکەوتوانی زۆر بون.

مەعقەل لەسەرزەمینی ئەهواز مایەوە و هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عەلی نوسی. عەلی نامەکەی بۆ هاورێکانی خوێندەوە ولەگەڵ ئەوان راوێژی کرد. هەموویان وتیان: بەباشی دەزانین فەرمان بەمەعقەل بدەیت بەدوای ئەو پیاوە خراپەکارەدا بگەڕێت یا بیکوژێت یا بۆ دوردەستەکان دوری بخاتەوە چونکە دەترسم خەڵك دژی تۆ هان بدات.

عەلی نامەی بۆ مەعقەل نوسی و سوپاسی خۆی و هاورێکانی کرد و فەرمانی پێدا

شوێن خێریت بکەوێت تا دەیکوژێت یا بۆ دووردەستەکان دوری دەخاتەوە. مەعقەل سەبارەت بەو پرسیاری کرد وپێیان وت شوێنەکەی لەکەنارەکانی دەریایە و خەڵکی لەفەرمانبردن لەعەلی دورخستۆتەوە و کەسانێکی لەعەبدئەلقەیس و عەرەبەکانیتری هاوڕێی گومرا کردوە. خەڵکەکەی لەساڵی شەڕی صەفین و ئەو ساڵە زەکاتیان نەدا. مەعقەل لەرێگەی فارسەوە بەرێکەوت و گەشتە کەنارەکانی دەریا.

کاتێك خێریت کوڕی راشد لەهاتنەکەی ئاگادار بویەوە، بەهاوەڵانی خۆی لەخەواریجی وت: من لەگەڵ ئێوە هاوباوەڕم و بۆچونم وایە عەلی نەدەبوا بەهەڵبژاردنی داوەر رازی دەبو. بەهاورێکانی دیکەی خۆی وت: عەلی داوەری هەڵبژارد و بەفەرمانی داوەرەکەی خۆی رازی بو و داوەرە هەڵبژێردراوەکەی ئەوی لەسەر کار لابرد. بەم باوەڕەوە لەکوفە هاتەدەر و بەردەوام باوەڕی پێی بو. بەنهێنی بەلایەنگرانی عوسمانی وت: سوێند بەخوا ئێمە لەگەڵ ئێوەین، سوێند بەخوا عوسمان بەستەم کوژرا، ئەو هەردەستەیەك لەخەڵکی بەشێوەیەك دڵخۆش دەکرد وبەوتەیەك فریوی دەدان. بەو کەسانەی باجیان نەدابو، وتی: دەستی خۆتان بەبەهێزی بخەنە سەر زەکاتەکانتان و بەو زەکاتانە میوانداری خزمەکانتان بکەن.

خەڵکانی مەسیحی زۆر لەناو ئەوان دەبینران کەباوەڕیان بەئیسلام هێنابو. کاتێك خەڵك بەناسازگاری گەیشتن، ئەم مەیسحیانە وتیان: سوێند بەخوا ئەو دینەی لێی هاتینەدەر، باشتر لەدینەکەی ئەمان بو. چونکە دینەکەیان رێگەی خوێن رشتنیان لێ ناگرێت.

خێریت بەوانی وت: هاوار لەئێوە! ئێوە لەکوژران ناپارێزێت مەگەر خۆڕاگری و کوشتنی ئەم خەڵکە چونکە فەرمانی ئەوان سەبارەت بەکەسێك کەباوەڕ بێنێت و دواتر پەشیمان ببێتەوە، ئەوەیە دەستبەجێ و بێ دەرەنگ بکوژرێت و هیچ بیانو و بەڵگەیەك لەو وەرناگیرێت. ئەو هەموانی فریودا و دەستەیەکی فراوان لەبەنی ناجیە، لەدەوری ئەو کۆبونەوە.

کاتێك مەعقەل پێی گەیشت، ئالای ئەمانی هەڵکرد و وتی: هەرکەس بێتە ژێر ئەم ئالایە، ئەمان دەدرێت جگە لەخێریت و هاورێکانی ئەو لەبەر ئەوەی یەکەم جار ئەوان شەڕیان دژی ئێمە دەست پێکرد. جگە لەخەڵکی خێریت، زۆربەی ئەو کەسانەی

لەدەوری کۆببونەوە، بڵاوەیان لێکرد. مەعقەل هاورێکانی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و پێشڕەوی بەرەو خێریت و هاورێکانی لەموسوڵمانان و مەسیحیەکان و باج نەدەرەکان دەست پێکرد.

خێریت بەهاوەڵانی خۆی وت: بۆ پاسەوانی کردن لەخۆتان و بنەماڵەکانتان شەڕ بکەن چونکە ئەگەر بەسەر ئێوەدا زاڵبن، سوێند بەخوا هەموتان دەکوژن و ژن و منداڵەکانتان ئەسیر دەکەن.

پیاوێك لەخەڵکەکەی پێی وت: سوێند بەخوا ئەم گرفتاریە لەسەر دەستی تۆ و زمانی تۆ بەسەر ئێمەدا هات..

خێریت وتی: شمشێر پێش سەرکۆنە کردن کەوت.

مەعقەل لەناو خەڵکەکەی خۆی بەرێکەوت و ئەوانی بۆ شەڕ هاندەدا و بەردەوام دەیوت: ئەی خەڵکینە، ئایا شتێك باشتر لەم پاداشتە بەهادارە دەناسن کەخوا بەئێوەی بەخشیوە؟ خوا ئێوەی بۆ شەڕی ئەو کەسانە رەوانە کردوە کەزەکات نادەن و پشتیان کردۆتە ئیسلام و بەشێوەیەکی ستەمکارانە بەیعەتی خۆیان خستۆتە ژێرپێ. شایەتی دەدەم هەر کەس لەئێوە بکوژرێت، دەڕواتە بەهەشت و هەر کەس زیندو بێت، خوا چاوی بەسەرکەوتن رون دەکاتەوە. دواتر مەعقەل و سوپاکەی هێرشیان دەستپێکرد و شەڕ و خۆڕاگریان کرد. لەم کاتەدا نوعمان کوڕی صوهبانی راسبی چاوی بەخێریت کەوت. پەلاماریدا و لەئەسپەکەی خستیە خوار. دواتر لەیەکیاندا و نوعمان ئەوی کوشت. لەهاورێکانی ئەو سەد و حەفتا پیاوی شەڕکەر کوژران و پاشماوەکانیان بۆ چەپ و راست رایان کرد. مەعقەل تا ئەو شوێنەی دەیتوانی ژن و منداڵەکانی ئەوانی بەئەسیری گرت و پیاوانێکی زۆری بازداشت کرد. هەرکەسێك موسوڵمان بو ئازادی کرد و بەیعەتی لێوەرگرت و بنەماڵەکەی پێسپاردەوە. ئەوانەی لەدین هەڵگەڕابونەوە، پێشنیاری ئیسلامی پێکردن کەرازی بون و مەعقەل ئەوانی ئازاد کرد و بنەماڵەکانی بۆ گەڕاندنەوە. ئەمە جگە لەپیرەپیاوێکی بەتەمەن لەمەسیحیەکان بەناوی روماحس بو چونکە باوەڕی نەهێنا و مەعقەل کوشتی. ئەوانەی زەکاتیان نەدابو، کۆی کردنەوە و زەکاتی دوساڵی لێوەرگرتن. مەسیحیەکان و بنەماڵەکانی ئەوانی هەڵگرت و لەگەڵ خۆی رەوانەی کردن و موسوڵمانەکان بەدوای ئەواندا بەرێکەوتن. کاتێك ماڵئاواییان

لەوان کرد، ژنان وپیاوان لەجیابونەوە لەیەك دەستیان بەگریان کرد بەرادەیەك خەڵکان بەزەییان بەواندا دەهاتەوە.

مەعقەل نامەی بۆ عەلی نوسی و هەواڵی سەرکەوتنی پێ بەخشی. دواتر لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی بەرێکەوت تا لای مەصقەلە کوڕی هوبەیرەی شەیبانی تێپەڕی. ئەو کارگوزاری عەلی لەئەردەشێر خەرە بو و ژمارەیان پێنسەد کەس. ژنان و منداڵەکان دەستیان بەگریان کرد و پیاوەکان هاواریان کرد: ئەی باوکی فەزل، ئەی پەنادەری ناتەوانەکان و ئەی رزگارکەری گرفتاران، منەتمان بخەرەسەر و بمانکڕە و ئازادمان بکە. مەصقەلە وتی: سوێند بەخوا بۆ رزگاری ئێوە زێر دەبەخشم چونکە خوا خەرج کردنی لەرێگەی چاکەکاریدا خۆش دەوێت. وتارەکەی بەگوێی مەعقەل گەیشت، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر گومانم دەکرد ئەم وتەی وەك دلسۆزی کردن بۆ ئەوان و ریسوایی ئێمە هێناوەتە سەرزمان، دەمکوشت هەرچەندە لەم رێگادا خەڵکی بەنی تەمیم وبەکر لەناو دەچون. مەصقەلە ئەوانی بەپێنسەد هەزار درەم کڕی. مەعقەل وتی: بەهای ئەوان بەخێرایی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالب رەوانە بکە. وتی: ئێستا بەشێکی دەنێرم و دواتر بەش بەش رەوانەی دەکەم تا هیچ لەئەستۆمدا نەمێنێت.

مەعقەل گەڕایەوە لای عەلی و لەوەی رویدا بو ئاگاداری کردەوە. عەلی کاری ئەوی بەچاکە لەقەڵەمدا. هەواڵ بەعەلی گەیشت کەمەصقەلە ئەسیرەکانی ئازاد کردوە و داوای لەوان نەکردوە، هاوکاری بکەن. فەرموی: گومانم ئەوەیە مەصقەلە تاوانێکی گرتۆتە ئەستۆ و بەم زوانە لەبەرابەر ئەم کارەی ریسوا دەبێت. عەلی نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا یا سامانەکە رەوانە بکات یا بڕواتە لای ئەو. ئەو رۆشتە لای عەلی و لەقەرزەکەی دوسەد هەزار درەمی دا.

زوهەل کوڕی حارس دەڵێت: شەوێك منی بۆ لای خۆی بانگ کرد و کاتێك نانمان خوارد، وتی: سەروەری باوەڕداران داوای ئەم پارەی لەمن کرد و من توانایی دانی ئەو پارەم نیە. وتم: سوێند بەخوا ئەگەر بتەوێت، هەینیەك تێناپەڕێت پارەکە دەدەیت. مەسقەلە وتی: سوێند بەخوا نامەوێت ئەم بارە قورسە بخەمە سەر شانی خەڵکەکەم. سوێند بەخوا ئەگەر کوڕی هند دەبو، داوای لەمن نەدەکرد و ئەگەر کوڕی عەفان دەبو، بەمنی دەبەخشی. نەتبینی ئەو ساڵانە سەد هەزار لەباجی ئازەربایەجانی

بەئەشعەس کوڕی قەیس دەدا؟ وتم: ئەم پیاوە ئەو کارە ناکات ویەك دینار بەناڕەوا ناخاتە بەر دەستی کەسێك. مەصقەلە هەمان شەو رایکرد و پەیوەستی معاویە بو. هەواڵی ئەم کارەیان بەعەلیدا. وتی: ئەو چی بەسەرهات، خوا خەمباری بکات. وەك سەروەران زێری رژاندە پێی خەڵکەکەی خۆی و وەك کۆیلەکان لەماڵی گەورەکەی خۆی رایکرد و هاوشێوەی گوناحکاران تەپوتۆزی خیانەتی بەرز کردەوە. بزانن ئەگەر دەمایەوە و ناتەوان دەبو، تەنیا زیندانیمان دەکرد. ئەگەر شتێکمان لێ دەدی، لێمان دەسەند وەگەرنە ئازادمان دەکرد.

دواتر عەلی ڕۆشتە ماڵەکەیی و وێرانی کرد و ئازادی ئەسیرەکانی پشت ڕاست کردەوە و وتی: کڕیار ئەوانی ئازاد کرد و بەهای ئەوان لەئەستۆی ئازادکەرەکەیان مایەوە.

براکەی نوعەیم کوڕی هوبەیرە لەشوێنکەوتوانی عەلی بو. مەسقەلە لەشام نامەی بۆ نوسی و نامەکەی بەپیاوێکی مەسیحی بەناو حەلوان رەوانە کرد. لەنامەکەدا نوسی: معاویە مژدەی رێزلێنان و فەرمانڕەوایی پێداویت، ئەو ساتەی نامەکەی من بەتۆ دەگات، بەرێکەوە. سلاّو لەتۆ. مالك کوڕی کەعبی ئەرحەبی ئەوی گرت و رەوانەی عەلی کرد. عەلی دەستی ئەو پیاوەی بڕی و لەتاو ئازارەکەی مرد. نوعەیم نامەی بۆ براکەی نوسی و ئەم قسانەی بۆ نوسی:

| | |
|---|---|
| لاترمین هداك الله معترضا | بالظن منك فما بالى و حلوانا |
| ذاك الحريص على مانال من طمع | و هو البعيد فلا يحزنك ان خانا |
| ماذا اردت الى ارساله سفها | ترجو سقاط امرى لم يلف و سنانا |
| قد كنت فى منظر عن ذا و مستمع | تحمى العراق و تدعى خير شيبانا |
| حتى تقحمت امرا كنت تكرهه | للراكبين له سراو اعلانا |
| عرضته لعلى انه اسد | يمشى العرضنة من اساد خفانا |
| لو كنت اديت مال القوم مصطبرا | للحق احييت احيانا و موتانا |
| لكن لحقت باهل الشام ملتمسا | فضل ابن هند و ذاك الراى اشجانا |
| فاليوم تقرع سن العجز من ندم | ما ذا تقول و قد كان الذى كانا |
| اصبحت تبغضك الاحياء قاطبة | لم يرفع الله بالبغضاء انسانا |

یانی: خواوەند بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیت بکات، بەگومان تیر مەهاوێژە. من چ کارێکم بەحیلوان هەیە؟ ئەو پیاوە تەماحکارە کە لەچاو برسیەتی گرفتاری چارەنوسی خۆی بو، پیاوێکی دور لەئێمە بو. کەواتە ئەگەر خیانەتی کرد، خەمبار مەبە. چیت دەویست ئەگەر ئەوت نەزانانە ڕەوانە کرد. هیوای ڕوخانی پیاوێکت کرد چاوەکانی هیچ کات خەوی نایباتەوە. تۆ لەپێگەیەکدا بویت کەهەمو شتێکت دەبینی و دەبیست و پاسەوانی عێراقت دەکرد و باشترین خەڵکی شەیبان لەقەڵەم دەدرایت. تا ئەوەی خۆت خستە ناو کارێك کەبێزار بویت لێی و ئەو کەسانەی ئەو کارەیان دەکرد بەئاشکرا و نهێنی سەرکۆنەت دەکردن. ئەو پیاوەت گرفتاری عەلی کرد، ئەو شێرێك لەشێرەکانی دارستانی ئازایەتیە، بەرادەیەك بەخێرایی هەڵبەز و دابەز دەکات کەهیچ کەس پێی ناگاتەوە. ئەگەر خۆڕاگریت دەکرد و سامانی ئەم خەڵکەت لەروی ڕاستی و دروستیەوە دەدا، زیندو و مردوی ئێمەت زیندو نەدەکردەوە. بەڵام پەیوەستی خەڵکی شام بویت و دەستی سواڵکردنت بۆ کوڕی هند درێژ کرد و ئەم کارە بو ئێمەی خەمبار کرد. ئەمڕۆ لێو بەدیانی پەشیمانی دەگەزیت. ئێستا کەئەم پێشهاتانە ڕویداوە، دەتوانی چی بڵێیت. کاروبارت گەشتۆتە شوێنێك هەمو تیرە و هۆزەکان تۆ بەدوژمنی خۆیان دەزانن، خوا هیچ کەسێك لەسەر بنەمایی دوژمنی بۆ پێگەیەکی بڵند، بەرز ناکاتەوە.

کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت، زانی حیلوان لەناو چوە. تەغلەبیەکان ڕۆشتنە لای و خوێنبایی ئەو پیاوەیان داوا کرد. ئەو خوێنباییەکەی دا.

یەکێکی دیکە لەشاعیرەکان سەبارەت بەبەنی ناجیە وتویەتی:

سما لکم بالخیل قودا عوابسا    اخو ثقة ما یبرح الدهر غازیا

فصبحکم فی رجله و خیوله    بضرب تری منه المدجج هاویا

فاصبحتم من بعد کبر و نخوة    عبید العصا لا تمنعون الذراریا

یانی: برایەك دەتوانرا پشتی پێ ببەسترێت، سوار لەسەر ئەسپە ڕام و دەستەمۆکان، هێرشی کردە سەر ئێوە. ئەو پیاوێکە تا کۆتایی ڕۆژگار وەك شەڕکەر دەمێنێتەوە. بەرەبەیانان لەگەڵ پیادەکان و سوارەکانی خۆی هێرشی کردە سەر ئێوە و بەردەوام شمشێری دادەباراند و سەرە زرێ پۆشەکان وەك گەڵای دارەکان لەسەر زەوی

بەگەوتویی دەتانبینی. ئێوە لەبەر گەورەیی و لەخۆرازی بون، بەگۆچانێك راونران بەشێوەیەك نەتانتوانی ژنان و منالەكانی خۆتان بپارێزن.

مەصقەلە كوڕی هوبەیرە وتی:

| | |
|---|---|
| لعمری لئن عاب اهل العراق | علی انتعاش بنی ناجیه |
| لا عظم من عتقهم رقهم | و كفی بعتقهم مالیه |
| و زایدت فیهم لا طلاقهم | و غالیت ان العلی غالیه |

یانی: سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر عێراقیەكان بۆ سەرقاڵ بون بەكاری بەنی ناجیە سەركۆنەم بكەن، گرانتر لەئازادی ئەوان كۆیلایەتی ئەوان بو و سامانی من بۆ ئازاد كردنی ئەوان بەسندەی دەكرد. بۆ ئازاد كردنی ئەوان بەهایەكی زۆرمدا. بەڵێ، رێزداری و كرداری چاكەكارانە، گرانە.

## چارەنوسی خەواریج دوای شەڕی نەهرەوان

كاتێك نەهرەوانیەكان كوشتار كران، ئەشرەف كوڕی عەوف شەیبانی هاورێ لەگەڵ دوسەد پیاوی شەڕكەر لەدەسكەرە دژی عەلی شۆڕشی كرد. عەلی ئەبرەش كوڕی حسانی هاورێ لەگەڵ سێسەد پیاوی شەڕكەر بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە كرد. ئەبەرش شەڕی لەگەڵدا كرد و لەمانگی رەبیع الثانی ساڵی سی و هەشت /سێپتامبەری ٦٥٨ زایینی كوژرا.

دواتر هیلال كوڕی عولەفە لەتیم ئەلرباب هاورێ لەگەڵ براكەی موجالد كوڕی عولەفە شۆڕشی كرد و عەلی مەعقەل كوڕی قەیسی ریاحی بۆ شەڕی ئەو رەوانە كرد كەئەو و هاورێكانی (زیاتر لەدوسەد پیاوی شەڕكەر) كوشتار كرد.

دواتر ئەشهەب كوڕی بشر یا ئەشعەس كوڕی بشر لەخەڵكی بوجەیلە لەگەڵ سەد و هەشتا لەهاورێكانی خۆی رۆشتە ئەو گۆڕەپانەی هیلال كوڕی عولەفە و هاورێكانی كوژران. لەسەر ئەوان نوێژی خوێند و تا ئەو جێگەی توانی ئەوانی بەخاك سپارد. عەلی جاریە كوڕی قودامەی سەعدی یا حوجر كوڕی عودەی بۆ شەڕی ئەو رەوانە كرد. ئەشهەب روبەرویان بویەوە. هەردولای شەڕكەر لەجەراجەرایا لەسەرزەمینی جوخی روبەروی یەك بونەوە و ئەشهەب و هاورێكانی لە جەمادی الثانی ساڵی سی و

هەشت /نۆڤەمبەری ٦٥٨ زایینی کوشتار کران.

دوای ئەوە ئەبو مریەم سەعدی تەمیمی شۆڕشی کرد و ڕۆشتە شارەزور. زۆربەی هاورێکانی ئەو (موالیەکان) بون. دەستەیەك دەڵێن: ئەو تەنیا شەش عەرەبی لەگەڵدا بو کەخۆی یەکێك بو لەوان. لەدەوری ئەو دوسەد یا چوارسەد پیاو کۆبونەوە. گەڕایەوە و پێشڕەوی کرد تا گەشتە پێنج فەرسەخی کوفە و لەوێ دابەزی. عەلی کەسی بۆ لای ئەو رەوانە کرد و داوای لێکرد ڕێز لەبەیعەتەکەی خۆی بگرێت و بگەڕێتەوە بۆ ناو کوفە. ئەبومریەم رازی نەبو و وتی: تەنیا شەڕ لەنێوان ئێمە رودەدات. عەلی شورەیح کوڕی هانی لەگەڵ حەوتسەد سوارکار بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە کرد. خواریج هێرشیان کردە سەر شورەیح و هاورێکانی و ئەوان لەیەك پچڕان و دوسەد کەس لەگەڵ شورەیحدا مانەوە. ئەو ڕۆشتە دێهاتێك لەو نزیکانە و لەوێ هاورێکانی پەیوەستی بون و کەسانێتر بۆ کوفە گەڕانەوە. عەلی خۆی هاتەدەر و جاریە کوڕی قودامەی سەعدی لەپێش خۆیەوە رەوانە کرد. جاریە پێشنیاری فەرمانبەری لەعەلی پێکردن و لەمەترسی کوژران ئاگاداری کردنەوە بەلأم رازی نەبون. عەلی خۆی پەیوەستیان بو و داوای لێکردن فەرمانبەر بن و رازی نەبون. عەلی و هاورێکانی شمشێریان خستە نێوان ئەوان و کوشتاریان کردن و جگە لەپەنجا کەس رزگاریان نەبو و داوای ئەمانیان کرد و عەلی ئەمانی پێدان. لەناو خەواریج چل کەس بریندار بون و عەلی فەرمانی دەرکرد بیانبەنە ناو کوفە. دواتر دەرمانیان کردن تا چاکبونەوە. کوشتاری ئەوان لەمانگی رەمەزانی ساڵی سی و هەشت / مارسی ٦٥٩ زایینی رویدا. ئەوان بوێرتریان شەڕکەرانی دەرەکی بون و لەبەر ئازایەتی خۆیان بو لەکوفە نزیك کەوتنەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا قوسەم کوڕی عەباس لەلایەن عەلیەوە حەجی کرد. ئەو کارگوزاری عەلی لەمەککە بو.

فەرماندارەکانی ئەو: لەیەمەن، عەبداللە کوڕی عەباس، لەبەسرە عەبداللە کوڕی عەباس و لەخوراسان خولەید کوڕی قورەی یەربوعی یا کوڕی ئەبزا. میسر و شام لەدەستی معاویە کوڕی ئەبی سوفیاندا بو.

بەوتەی هەندێ کەس لەم ساڵەدا صوهەیب کوڕی سەنان لەحەفتا ساڵیدا مرد و لەبەقیع بەخاك سپێردرا.

## روداوەکانی ساڵی سی و نۆی کۆچی ( ٦٥٩ زایینی )

## هێرش و پەلاماری خەڵکانی شام بۆ سەرزەمینەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالب

لەم ساڵەدا معاویە لەشکری خۆی بۆعێراق، بۆ دەوروبەر و سەرزەمینەکانی ژێر دەسەلأتی عەلی رەوانە کرد. ئەو نەعمان کوڕی بەشیری لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ عەین ئەلتەمەر رەوانە کرد کە مالك کوڕی کەعب لەوێ لەیەکێك لەپادگانەکان فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەی دەکرد و هەزار شەڕکەری لەبەردەستا بو. مالك دەستوری بەهاوڕێکانی خۆیدابو بڕۆنە کوفە و لەبەر ئەمە تەنیا سەد شەڕکەر مابونەوە. کاتێك هەواڵی هاتنی نەعمانی بیست، نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نوسی و ئاگاداری کردەوە و داوای هاوکاری کرد. عەلی لەناو خەڵکی کوفە وتارێکیدا و فەرمانی پێدان بۆ شەڕی دوژمن بەرێکەون. کوفیەکان لاوازیان لەخۆیان نیشاندا. مالك روبەروی نەعمان بویەوە و خۆی و هاورێکانی لەپشت دیواری گوندەکە پەنایان گرت. مالك بۆ مێخنەف کوڕی سولەیم نامەی نوسی و داوای هاوکاری لێکرد چونکە ئەم دوانە لەیەکەوە نزیك بون. مالك و نەعمان شەڕێکی قورسیان کرد. مێخنەف کوڕەکەی خۆی عەبدولرەحمانی لەگەڵ پەنجا پیاوی شەڕکەر بۆ هاوکاری مالك رەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە لای مالك و کالانی شمشێرەکانی خۆیان شکاندبو و چاوەڕوانی شەڕێکی قورس و خوێناویان دەکرد. کاتێك خەڵکانی شام ئەوانیان بینی، لەکاتی ئێوارێ پاشەکشێیان کرد چونکە گومانیان دەکرد هێزە یارمەتیدەرەکان گەیشتون. مالك شوێنیان کەوت و سیان لەوانی کوشت.

کاتێك خەڵکانی کوفە بۆ هاوکاری کردنی مالك لاوازیان لەخۆیان نیشاندا، عەلی رۆشتە سەر تەختی وتاردان و قسەی بۆ کردن و داوتر وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، هەرجار کەبیستتان دەستەیەك لەشامیەکان هێرشیان کردۆتە سەرتان، هەرکام لەئێوە وەك مارمێلك خزانە ناو کونە تاریکەکەی خۆتانەوە و درگاتان لەسەر خۆتان داخست وەك کەمتیار لەهێلانەدا خۆتان شاردەوە. فریوخواردو ئەو کەسەیە فریوی هێزی ئێوە

بخوات. هەر کەس بیەوێت بەهاوکاری ئێوە کارێك ئەنجام بدات، زیانبارترین بەهرەکان وەردەگرێت. نەجوامێرەکانن لەکاتی فریاخوازی و نەبراکانن لەکاتی بانگەواز. هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەرێینەوە (بقرە/١٥٦) چ ڕەنجێکە لەدەست ئێوە گرفتاری بوم؟ کوێرن و نابینن، لاڵن و قسە ناکەن و کەڕن و نابیسن! هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە سوفیان کوڕی عەوف بەشەش هەزار پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا و خۆی بگەیێنێتە هیت و لەوێ تێپەڕێت و دواتر بەرەو ئەنبار و مەداین بڕوات و خەڵکەکی کوشتار و تالآن بکات. ئەو گەیشتە هیت بەلآم کەسی لەوێ نەبینی. دواتر ڕۆشتە ئەنبار و یەکێك لەپادگانەکانی عەلی لەوێ بو و پێنسەد پیاوی شەڕکەر لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد بەلآم بلآوببونەوە و ئێستا تەنیا دوسەد پیاو لەناو پادگانەکەدا بون. هۆکاری بلآوبونەوەیان ئەوە بو فەرماندەکەیان کومەیل کوڕی زیاد بو. هەواڵی پێگەیشت دەستەیەك دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر هیت. لەبەر ئەمە بێ فەرمانی عەلی روبەروی ئەوان بویەوە و ئەم کارە توڕەیی عەلی لێکەوتەوە. عەلی نامەی بۆ نوسی و بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەی کرد. سوفیان کوڕی عەوف چاوی تەماحی بڕیە هاوەلآنی عەلی چونکە ژمارەیان کەم بو. هاورێکانی عەلی ئەوەندە خۆڕاگریان کرد تا فەرماندەکەیان ئەشرەس کوڕی حسان و سی کەس لەهاوەلآنی کوژران. تالآنچیەکان هەمو سامانی خەڵکانی ئەنباریان هەڵگرت و بردیان و گەڕانەوە بۆ لای معاویە. هەواڵی ئەم کارە بەعەلی گەیشت وشەڕکەرانی بەدوای ئەواندا ڕەوانە کرد بەلآم نەیانتوانی بیانگرن و گەڕانەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە عەبدالله کوڕی مەسعەدە کوڕی حەکەمە کوڕی بەدری فەزاری بەهەزار و حەوتسەد پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا بڕواتە تەیما و لەسەر رێگای خۆی زەکات لەبیابان نشینەکان وەربگرێت و هەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانی کرد، بیکوژێت. عەبدالله ئەو کارەی کرد و خۆی گەیاندە مەککە و مەدینە و لەوێش ئەو کارەی کرد. کەسانێکی زۆر لەخەڵکەکەی لەدەوری کۆبونەوە. هەواڵی ئەم کارە بەعەلی گەیشت و موسەیب کوڕی نەجەبەی فەزاری هاورێ لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. عەبدالله کوڕی مەسعەدە بۆ تەیما

رایکرد و موسەیب خۆی پێگەیاند و شەڕ دەستی پێکرد. لەنێوان ئەوان شەڕێکی قورس رویدا وهەردو لای شەڕکەر بەسەختی تێدەکۆشان تا ئەوەی خۆر ئاوا بو. موسەیب هێرشی کردە سەر کوڕی مەسعەدە و سێ جار شمشێری لێدا بەلام نەك بەمناهەنگی کوشتنی ئەو. بەردەوام پێی دەوت، رابکە، رابکە. کوڕی مەسعەدە لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی پەنایان بۆ قەلایەك برد و کەسانیتر بۆ شام هەلاتن. بیابان نشینەکان وشترەکانی زەکاتی کوڕی مەسعەدەیان تالان کرد. ئەو بۆ ماوەی سێ رۆژ کوڕی مەسعەدەی گەمارۆدا. دواتر ئاگری لەدەرگای قەلاکە بەردا و سوتاندی. چونکە ئەوان لەناوچونیان بەچاوی خۆیان بینی، هاتنە سەر دیوارەکان و هاواریان کرد: ئەی موسەیب، فریایی خەڵکەکەی خۆت بکەوە. موسەیب دڵی بۆ ئەوان سوتا وفەرمانیدا ئاگرەکەیان کوژاندەوە. بەهاورێکانی خۆی وت: هەواڵنێران هاتونەتە لای من و ئاگاداریان کردومەتەوە دەستەیەك لەخەڵکانی شام ئاهەنگی شەڕی ئێومیان کردوە. عەبدولرەحمان کوڕی شەبیب وتی: من بۆ شەڕی ئەوان رەوانە بکە. موسەیب رازی نەبو و عەبدولرەحمان وتی: خیانەتت لەسەرومری باوەڕداران کرد و لەکارەکەی ئەو لاوازی لەخۆت نیشاندا.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە زوحاك کوڕی قەیسی رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەخوارەوەی واقیصە تێپەڕێت و فەرمان بکاتە سەر هەمو بیابانشینەکانی ژێر فەرمانی عەلی و ئەوان تالان بکات. معاویە سێ هەزار پیاوی شەڕکەری لەگەڵ ئەو رەوانە کرد. ئەوان بەرێکەوتن و سامانەکانیان هەلگرت و رۆشتنە سەعلەبیە و هێرشیان کردە سەر پادگانەکەی عەلی وکوشتار و تالانیان کرد و خۆیان گەیاندە قوتقوتانە. کاتێك هەواڵی ئەم کارە بەعەلی گەیشت، حوجر کوڕی عودەی لەگەڵ چوارهەزار پیاوی شەڕکەر بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە کرد و پەنجا پەنجا بەسوپاکەی بەخشی. حوجر لەتەدمور خۆی گەیاندە زوحاك و نۆزدە کەس لەهاورێکانی ئەوی کوشت و دوان لەیارانی خۆی کوژران. زوحاك و دارودەستەکەی هەلاتن و حوجر و داروودەستەکەی شوێنیان کەوتن.

## چەند روداوێك

لەم ساڵەدا معاویە بەرەو عێراق بەرێکەوت تا گەیشتە دیجلە و دواتر بۆ شام گەڕایەوە. جیاوازی لەنارادایە کە لەم ساڵەدا چ کەسێك لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. دەستەیەك دەڵێن: عوبەیدالله کوڕی عەباس لەلایەن عەلیەوە حەجی کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو براکەی عەبدالله کوڕی عەباس ئایینی حەجی ئەنجامدا. ئەمە راست نیە چونکە عەبدالله کوڕی عەباس لەخەلافەتی عەلی حەجی نەکرد بەڵکو سەرپەرەستی ئایینەکانی حەج لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی عەباس بو. معاویەیشی یەزید کوڕی شەجەری رەهاوی رەوانە کرد و لەلایەن معاویەوە حەجی کرد. عوبەیدالله و یەزید ناسازگاری کەوتە نێوانیان و لەبەر ئەمە رێککەوتن تا شیبە کوڕی عوسمان ئاهەنگی حەج ئەنجام بدات. دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی ئایینی حەجی لەلایەن عەلیەوە ئەنجامدا، قوسەم کوڕی عەباس بو. فەرماندارەکانی عەلی لەشارەکان هەمان کەسان بو کەپێشتر ئاماژەمان پێدان.

بەرێکەوتنی یەزید کوڕی شەجەرە بۆ مەککە

لەم ساڵەدا معاویە یەزید کوڕی شەجەرەی رەهاوی لەهاورێکانی خۆی بانگ کرد و پێی وت: دەمەوێت تۆ بۆ مەککە رەوانە بکەم تا ئایینی حەج بۆ خەڵك ئەنجام بدەیت و لەخەڵکی ئەم شارە بۆ من بەیعەت وەربگریت و نوێنەری عەلی لەوێ دەرپەڕێنیت.

یەزید رازی و هاورێ لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر بەرەو مەککە بەرێکەوت کەقوسەم کوڕی عەباس لەلایەن عەلیەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرد. کاتێك قوسەم ئەم هەواڵەی بیست، قسەی بۆخەڵکانی مەککە کرد و ئاگاداری کردنەوە کەخەڵکانی شام ئاهەنگی شەڕیان هەیە. ئەو بانگەوازی شەڕی راگەیاند. خەڵکانی مەککە وەڵامیان نەدایەوە. تەنیا شیبە کوڕی عوسمانی عەبدەری وەڵامی بانگەوازەکەی دایەوە. قوسەم بڕیاریدا لەمەککە بڕواتەدەر و پەنا بۆ یەکێك لەدۆڵەکانی دەوروبەر ببات و ئەم هەواڵە بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالب بنوسێت. ئەگەر سوپای بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد، لەبەرابەر شامیەکان خۆڕاگری دەکات. ئەبوسەعیدی خودری رێگەی ڕۆشتنەدەر لەمەککە لێگرت وپێی وت: لەشاردا بمێنەرەوە، ئەگەر ئەوان شەڕ دەست پێبکەن و تۆ

هێزت لەبەردەستا بێت، شەڕیان لەگەڵ بکە و بۆچونی خۆت بەکار ببە و گەرنە بڕۆدەر چونکە ڕێگەی ڕۆشتن بۆ تۆ بەردەوام کراوەیە. ئەو لەمەککە مایەوە و خەڵکانی شام گەیشتن بەڵام دەستیان بۆ شەڕ درێژ نەکرد. قوسەم نامەی بۆ عەلی نوسی و ئەوی لەم کارە ئاگادار کردەوە. عەلی سوپایەکی رەوانە کرد کەریان کوڕی زەمرە کوڕی هەومزە کوڕی عەلی حەنەفی و ئەبو توفەیل لەناویاندا بون. ئەم کارە لەیەکەمی زی حەججە/٣٠ ئاوریلی ٦٥٩ زایینی رویدا. گەشتنی کوڕی شەجەرە دو ڕۆژ پێش هەشتی زەی حەججە بو. ئەو لەناو خەڵك هاواری کرد: ئێوە ئەمانتان هەیە و ئاسودەن مەگەر ئەو کەسەی شەڕمان لەگەڵ بکات یا لەبەرابەر ئێمە خۆڕاگری بکات. ئەبوسەعیدی خودری بانگ کرد و پێی وت: من دەمەوێت گۆڕانکاری لەبارەگایی خوایی دروست بکەم و ئەگەر تۆ بتەوێت دەتوانیت ئەو کارە بکەیت چونکە فەرماندارەکەی ئێوە سستی و لاوازی لەخۆی نیشان دەدات. پێی بڵێ لەنوێژ کردن لەگەڵ خەڵك خۆی بەدور بگرێت و منیش خۆم بەدور دەگرم و خەڵك کەسێك هەڵدەبژێرن تا نوێژیان لەگەڵ بکات. ئەبوسەعید قوسەمی لەوتەکانی کوڕی شەجەرە ئاگادار کردەوە و قوسەم خۆی بەدور گرت و خەڵك شەیبە کوڕی عوسمانیان هەڵبژارد و لەگەڵ ئەوان نوێژی کرد و سەرپەرەستی حەجی گرتە ئەستۆ. کاتێك خەڵك لەحەج تەواو بون، یەزید بۆ شام گەڕایەوە. سوارەکانی سوپای عەلی گەیشتن وئاگاداریان کردنەوە کەخەڵکانی شام گەڕاونەتەوە. ئەوان بەفەرماندەیی مەعقەل کوڕی قەیس شوێن خەڵکانی شام کەوتن کە لەوادی ئەلقورا کۆچیان کردبو. کەسانێك لەوانیان گرت و کەل وپەلەکانیان لێ سەندن و بەئەسیری بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالبیان بردن. ئەو ئەسیرەکانی خۆی بەمعاویەدا و ئەسیرەکانی خۆی ئازاد کرد.

## هێرش و پەلاماری خەڵکانی شام بۆ سەر جەزیرە

لەم ساڵەدا معاویە عەبدولرەحمان کوڕی قەباس کوڕی ئەشیەمی بۆ سەرزەمینی جەزیرە رەوانە کرد کەشەبیب کوڕی عامر فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەی دەکرد. شەبیب لەنەصیبین بو. ئەو نامەیەکی بۆ زیاد کوڕی کومەیل لەعیت نوسی و لەم کارە ئاگاداری کردەوە. کومەیل لەگەڵ شەششەد سوار بۆ هاوکاری ئەو بەرێکەوت. ئەوان

روبەروی عەبدولرەحمان و هاورێکەی ئەو مەعن کوڕی یەزیدی سولەمی بونەوە. کومەیل لەگەڵ هەردوکیان شەڕی کرد و شکەستی دان و بەسەر سوپاکەیاندا زاڵ بو و کوشتاری کردن بەڵام فەرمانیدا شوێن هەڵاتوان نەکەون و بریندارەکان نەکوژن. لەیارانی کومەیل تەنیا دو کەس کوژران. ئەو هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عەلی نوسی. عەلی داوای پاداشتی چاکەی لەخوا بۆ کرد و وەڵامێکی چاکی دایەوە و لێی رازی بو چونکە لەبەر روداوەکەی پێشو، لێی توڕە بو.

شەبیب کوڕی عامر لەنەصیبین گەڕایەوە و بینی یارانی کومەیل خەڵکانی شامیان بەسەختی تێکشکاندوە. بۆ سەرکەوتنەکە پیرۆزبایی لێکرد و خۆی شوێن شامیەکان کەوت بەڵام ئەوانی نەدۆزیەوە. لەفورات تێپەڕی و سوپاکەی خۆی بڵاو کردەوە تا هێرش بکەنە سەر شامیەکان و تا بەعلبەك پێشڕەویان کرد. معاویە حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ روبەروبونەوەی رەوانە کرد بەڵام ئەوی نەبینی. شەبیب لەوێ گەڕایەوە و هێرشی کردە سەر پانتاییەکانی ڕەقە و بۆ شوێن کەوتوانی عوسمان هیچ داوێکی نەهێشتەوە مەگەر ئەوەی کۆی کردەوە و بۆ پێشەوە غاریدا و ئەسپ و کەرەستەی شەڕی نەدۆزیەوە مەگەر ئەوەی هەڵیگرت و بۆ نەصیبین گەڕایەوە و هەواڵی سەرکەوتنەکەی خۆی بۆ عەلی نوسی. عەلی نامەی بۆ نوسی و لەگرتنی ماڵ و سامانی خەڵك دوری خستەوە و تەنیا بەڕەوای زانی ئەسپ و کەرەستەکانی شەڕ بۆ شەڕی دوژمنان لەدەستی ئەوان دەربێنێت. عەلی وتی: خوا شەبیب بەختەوەر بکات چونکە هێرشی بردە سەر دوردەستەکانی دوژمن و بەپەلە تۆڵەی لەوان سەندەوە.

## هێرش و پەلاماری حارس کوڕی نمری تەنوخی

کاتێك یەزید کوڕی شەجەرە بۆ لای معاویە گەڕایەوە، ئەو حارس کوڕی نمری تەنوخی بۆ سەرزەمینی جەزیرە رەوانە کرد تا لایەنگرانی عەلی بباتە لای ئەو. ئەو حەوت کەسی لەخەڵکی دارا لەتەغلەبیەکان دەسگیر کرد و لەگەڵ خۆی بردی. پێشتر دەستەیەك لەتەغلەبیەکان پشتیان کردبوە عەلی و پەیوەستی معاویە ببون. ئەوان داوایان لەمعاویە کرد ئەوان ئازاد بکات بەڵام رازی نەبو. ئەم خەڵکە پشتیان کردە ئەو. معاویە نامەی بۆ عەلی نوسی وپێشنیاری کرد ئەوان لەبەرابەر ئەو کەسانەی

مەعقەل کوڕی قەیس لەهاوڕێکانی یەزید کوڕی شەجەرە بەئەسیری گرتبو، ئازاد بکات. عەلی رازی بو و ئەسیرەکانی رادەستی معاویە کردەوە و معاویە ئەوانی ئازاد کرد. عەلی پیاوێکی لەخەسعەم بەناوی عەبدولرەحمان بۆ پانتاییەکانی موسڵ رەوانە کرد تا خەڵك ئارام بکاتەوە و ئارامیان پێ ببەخشێت. ئەو تەغلەبیانەی لەمعاویە خۆیان بەدور گرتبو و رێبەرەکەیان قورمیع کوڕی حارسی تەغلەبی بو، روبەرویان بونەوە. ئەوان جوێنیان بەیەکدا و شەڕیان دەست پێکرد و تەغلەبیەکان ئەویان کوشت. عەلی بڕیاریدا سوپایەك بۆ سەرکوت و کوشتاری ئەوان رەوانە بکات. خەڵکی رەبیعە لەمبارەوە گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و پێیان وت: ئەوان پشتیان کردۆتە دوژمنەکەی تۆ و ملکەچی تۆ بون. ئەم پیاوەیان نەزانانە کوشتوە، لەوان خۆش ببە. عەلی دەستی لەوان هەڵگرت.

## بەسەرهاتی کوڕی عوشبە

معاویە زوهەیر کوڕی مەکحولی عامری لەعامر ئەلجدار بۆ سەماوە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا زەکاتەکانی خەڵك کۆبکاتەوە. هەواڵی ئەم کارە بەعەلی گەیشت وئەو سێ کەسی رەوانە کرد. جەعفەر کوڕی عەبداللە ئەشجەعی وعوروە کوڕی عوشبەی کەلابی و جولاس کوڕی عومەیری کەلبی. بەوانی فەرمو زەکات لەفەرمانبەرانی بەکر کوڕی وایل و کەلب وەربگرن. ئەوان روبەروی زوهەیر بونەوە و شەڕیان لەگەڵ کرد. یارانی عەلی شکەستیان خوارد و جەعفەر کوڕی عەبداللە کوژرا و کوڕی عوشبە بۆ لای عەلی گەڕایەوە. عەلی سەرکۆنەی کرد وچەند قامچیەکی لێدا. پیاو ڕەنجا و پەیوەستی معاویە بو. توڕەیی عەلی لەبەر ئەوە بو زوهەیر کوڕی مەکحول ئەسپێکی بە کوڕی عوشبە بەخشیبو و لێرەوە بو عەلی گومانی لەسەر ئەو دروست کرد. بەڵام سەربوردەی کوڕی جولاس بەو شێوە بو کەلای شوانێك تێپەڕی کرد و جلەکانی ئەوی وەرگرت و عابا هەوریشمیەکی خۆی بەودا. سوارەکان بەو گەیشتن و پرسیان: سوارەکان لەکوێ گرفتار بون؟ ئەو ئیشارەی بەوان کرد: لێرە گرفتار بون. دواتر روی کردە کوفە.

## بەسەرهاتی موسلیم کوڕی عەقەبە لەدومەئەلجەندەل

معاویە موسلیم کوڕی عوقەبەی موڕی بۆ دومەئەلجەندەل رەوانە کرد. خەڵکەکەی هەم پشتیان کردبوە پەیمانەکەیان لەگەڵ عەلی و هەم پشتیان کردبوە معاویە. ئەو فەرمانبردن لەمعاویەی پێ پێشنیار کردن بەڵام بەداواکەی رازی نەبون. ئەم هەواڵە بەعەلی گەیشت و ئەو مالك کوڕی کەعبی هەمەدانی هاورێ لەگەڵ دەستەیەك بۆ دومەئەلجەندەل رەوانە کرد. موسلیم نەکەوتبوە خۆ لەناکاو مالکی لەسەر سەری خۆی بینی. ئەوان بۆ ماوەی رۆژێك شەڕیان کرد و موسلیم شکەستی خوارد و هەڵات و مالك چەند رۆژێك مایەوە و داوای فەرمانبەری و بەیعەتی لەگەڵ عەلی دەکرد بەڵام ئەوان رازی نەبون و وتیان: بەیعەت ناکەین تا هەمو خەڵك لەسەر یەك رێبەر رێکەون. مالك دەستی لێ شۆردن و گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا حارس کوڕی موڕەی عەبدی بۆ شەڕ لەسەرزەمینی سند بەرێکەوت و بۆ ئەم کارە فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالبی پێدرابو. ئەوهێرشی برد و ئەسیر و تاڵانی زۆری دەست کەوت بەشێوەیەك لەیەك رۆژدا هەزار سەر مەڕوماڵاتی دابەش کرد. لەوێ مایەوە و سەرئەنجام لەساڵی چل و دو /٦٦٢ زایینی لەرۆژگاری معاویە، لەگەڵ هاورێکانی کوژرا و دەستەیەکی کەم لەیارانی رزگاریان بو.

## فەرمانڕەوایی زیاد کوڕی ئوبیە لەفارس

لەم ساڵەدا عەلی زیاد کوڕی ئوبیەی وەك فەرمانداری فارس و کرمان رەوانە کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبو کاتێك کوڕی حەزرەمی کوژرا و خەڵکان سەبارەت بەفەرمان بردن لەعەلی گیرۆدەی چەند بەرەکی بون، خەڵکی فارس و کرمان چاوی تەماحیان بڕیە نەدانی باج. خەڵکی هەر ناوچەیەك تەماحیان لادروست بو و فەرماندارەکەی خۆیان دەرکرد. خەڵکی فارس رویان کردە سەهل کوڕی حەنیف و ئەویان لەشارەکەی خۆیان دەرکرد. عەلی لەمبارەوە راوێژی لەگەڵ خەڵك کرد و جاریە کوڕی قودامە پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەربتەوێت پیاوێکت پێ دەناسێنم، بۆچونەکانی وەك پۆڵا، شارەزا لەبەرێوبردنی وڵات و شیاو بۆ ئەو کارەی

پێی دەسپێریت. عەلی پرسی: کێیە؟ وتی: زیاد. عەلی فەرمانی بەکوڕی عەباسدا ئەو دەست نیشان بکات. کوڕی عەباس ئەوی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان رەوانە کرد. ئەو هاوڕێ لەگەڵ ئەوان سەرزەمینە نائارامەکانی فارسی بڕی و ئارامی بۆ ئەو ناوچانە گەڕاندەوە. بەردەوام کەسی بۆ لای سەرکردە و گەورەکانی ئەوان رەوانە دەکرد و مژدە و ئارەزوی بەیارانی خۆی دەبەخشی و نافەرمانانی دەترساند. ئەوانی خستە گیانی یەك بەشێوەیەك هەر جێگەیەك شکەستی یەکیتری پێ نیشان دەدا. دەستەیەك هەڵاتن و دەستەیەك مانەوە و سەرئەنجام دەستیان بەکوشتاری یەك کرد. بەمشێوە فارس ملکەچی بو و هیچ سوپایەك و هیوای شەڕکردن بۆ فارسەکان نەمایەوە. ئەم شێوازەیشی لەکرمان بەکار برد. دواتر گەڕایەوە بۆ فارس و خەڵکی ئارام کردەوە و ئەوان فەرمانبرداری بون. ئەو لەئیستەخر دابەزی و قەڵایەکی بەهێزی لەنزیکی ئیستەخر دروست کرد کە بەقەڵای زیاد ناوبرا. دوای ئەو مەنسوری یەشکری لەو قەڵایەدا سەنگەری گرت و لەبەر ئەمە بەقەڵای مەنسور ناویان برد. دەستەیەك دەڵێن: کوڕی عەباس پێشنیاری کرد ئەو بۆ فەرمانداری راسپێرێت. پێشتر ئاماژەمان پێدا.

## بیرکردنەوەی روداوێك

لەم ساڵەدا باوکی مەسعودی ئەنساری مرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەولەسەرەتای خەلافەتی معاویە مرد. هەروەها ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکە داوە.ئەو لەشەڕی بەدر ئامادە نەبو و لەبەر ئەمە ئەویان بەبەدری ناودەبرد چونکە لەسەر ئاوەکانی بەدر دابەزی. منداڵەکانی ئەو لەناو چون و رەگەزی ئەو فەوتا.

# ڕوداوەکانی ساڵی چلی کۆچی (٦٦٠زایینی)

هێرش و پەلاماری بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا بۆ حیجاز و یەمەن

لەم ساڵەدا معاویە بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا کەپیاوێك لەهۆزی عامر کوڕی لۆئەی بو، هاورێ لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ کوشتار و تاڵانی ڕەوانە کرد. بەرێکەوت و گەیشتە مەدینە کەئەبو ئەیوبی ئەنساری لەلایەن عەلیەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرد. بوسر ڕۆشتە ناو مەدینە بەڵام کەس لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری نەکرد. ڕۆشتە سەرتەختی وتاردانی مزگەوتی ئەم شارە و هاواری کرد: ئای دیناریەکان، ئای نەجاریەکان، ئای زەریقیەکان، ئەمانە تیرەکانی ئەنسار بون. وتی: پیرەکەم، پیرە ڕێزدارەکەم دوێنێ لێر بینی، ئێستا لەکوێیە؟ مەبەستی عوسمان بو. دواتر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر پێشنیاری معاویە نەدەبو، یەك پیاو و یەك گەنجم بەزیندویی نەدەهێشتەوە. ئەو کەسی بۆ لای بەنی سەلە ڕەوانە کرد و پەیامیدا: سوێند بەخوا ئێوە لای من ئەمان دراو نین تا ئەو کاتەی جابر کوڕی عەبداللە دێننە لای من. جابر ڕۆشتە لای دایکی سەلە هاوسەری پێغەمبەر و وتی: چی دەبینیت؟ وتی: ئەمە بەیعەتێکی گومڕایە و دەترسم بکوژرێم؟ ژن وتی: بۆچونی من وایە بەیعەت بکەیت، چونکە خۆم بەکوڕەکەم عومەر و زاواکەم کوڕی زەمعەم وتوە بەیعەت بکەن. کچەکەی زێنەب هاوسەری کوڕی زەمعە بو. جابر ڕۆشتە لای ئەو بەیعەتی لەگەڵدا کرد.

ئەو چەندین ماڵی لەمەدینە وێران کرد و دواتر بەرەو مەککە بەرێکەوت. ئەبوموسا ئەشعەری ترسا بیکوژێت و لەبەر ئەمە هەڵات. ئەو بەزۆر خەڵکی ناچار بەبەیعەت کرد. دواتر ڕۆشتە یەمەن کە عوبیدالله کوڕی عەباس بەنوێنەرایەتی عەلی فەرمانڕەوایی ئەو سەرزەمینەی دەکرد. عوبەیدالله لەبەرابەر ئەو هەڵات و ڕۆشتە لای عەلی لەکوفە. عەلی لەجیاتی ئەو عەبداللە کوڕی عەبدئەلەدانی حارسی کردە فەرمانڕوایی یەمەن. بوسر هێرشی کردە سەر عەبداللە و هاورێ لەگەڵ کوڕەکەی کوشتی. دو مناڵی کەم تەمەنی لەعوبەیدالله کوڕی عەباس بەناوەکانی عەبدولرەحمان و قوسەم گرت و ئەو دوانەیشی کوشت. ئەم دوانە لەبیابان لای پیاوێکی کەنانە ژیانیان بەسەر دەبرد. پیاوی کەنانی پێی وت: بۆ دەتەوێت ئەم دو بێ

گوناحە بکوژیت؟ ئەگەر دەتەوێت ئەو کارە بکەیت، منیش بکوژە. ئەو پیاوی کەنانی کوشت و بەدوای ئەو دومناڵەکە. دەستەیەك دەڵێن: پیاوی کەنانی شمشێری هەڵگرت و پارێزگاری لەو دو مناڵە کرد و بەردەوام دەیوت:

اللیث من یمنع حافات الدار          و لا یزال مصلتا دون الجار

یانی: شێرە پیاو ئەو کەسەیە دەوروبەری ماڵەکەی خۆی بپارێزێت و بۆ پارێزگاری کردن لەپەنابەرەکەی خۆی بەردەوام شمشێرێکی هەڵکێشراوی لەدەستا بێت.

شەڕی کرد تا کوژرا. جەستەی دو مناڵەکەی هەڵگرت و بەخاکی سپارد. ژنان لەبەنی کەنانە هاتنەدەرو یەکێك لەوان وتی: ئەی پیاو، خەڵکانت کوشتار کرد، ئەم دو مناڵە بێ تاوانەت بۆ کوشت؟ ئەی کوڕی ئەبی ئەرتا سوێند بەخوا فەرمانڕەوایەتیەك تەنیا بەکوشتاری منداڵ و پیر وپێشێل کردنی مێهرەبانی و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی بەهێز بێت، فەرمانڕەوایەتی ستەمکارانەیە.

بوسر لەسەر ڕێگای خۆی دەستەیەك لەهاورێکانی عەلی لەیەمەن کوشتار کرد. عەلیان لەم پێشهاتانە ئاگادار کردەوە. ئەو جاریە کوڕی قودامەی سەعدی و وەهب کوڕی مەسعودی هەرکام هاورێ لەگەڵ دو هەزار پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد. جاریە بەرێکەوت تا گەیشتە نەجران ولەوێ دەستەیەك لەشوێنکەوتوانی عوسمانی کوشتار کرد. بوسر و هاورێکانی لەبەرابەر ئەو هەڵاتن و جاریە شوێنی کەوت تا گەیشتە مەککە (ئەمە دوای مردنی عەلی بو) و بەخەڵکەکەی وت: بەیعەت لەگەڵ سەروەری باوەڕداران بکەن. وتیان: ئەو مردوە، لەگەڵ کێ بەیعەت بکەین؟ وتی: لەگەڵ ئەو کەسەی هاورێکانی عەلی بەیعەتیان لەگەڵ کردوە. ئەوان لەترسا بەیعەتیان کرد.

دواتر بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو مەدینە و بینی ئەبوهورەیرە پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکات. ئەبو هورەیرە هەڵات. جاریە وتی: ئەگەر باوکی پشیلەم دەبینی، دەست بەجێ دەمکوشت. دواتر بەخەڵکانی مەدینەی وت: لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی بەیعەت بکەن. ئەوان بەیعەتیان کرد. ئەو ڕۆژە لەمەدینە مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ کوفە. ئەبوهورەیرە بۆ مەدینە گەڕایەوە وپێشنوێژی بۆ خەڵك کرد.

دایکی ئەو دو مناڵە بێ تاوانە کە لەسەر دەستی بوسر کوژران، دایکی حەکەم جویریە کچی خوەیلد کوڕی قارز بوە. دەستەیەك دەڵێن: عایشە کچی عەبداللە کوڕی

عەبدئەلمەدان بو. کاتێك دو کوڕەکەی سەریان بڕا، شینی بۆ گێڕان. ئەو بەردەوام دەگریا و دەیلاواندەوە. لەهەر کۆڕ و کۆبونەوەیەك دەگریا و دەیوت:

| | |
|---|---|
| یا من احس بنیی اللذین هما | کالدرتین تشظی عنهما الصدف |
| یا من احس بنیی اللذین هما | مخ العظام فمخی الیوم مزدهف |
| یا من احس بنیی اللذین هما | قلبی و سمعی فقلبی الیوم مختطف |
| من ذل و الهة حیری مدلهة | علی صبیین ذلا اذ غدا السلف |
| نبئت بسرا و ما صدقت ما زعموا | من افکهم و من القول الذی اقترفوا |
| احنی علی و دجی ابنی مرهفة | من الشفار کذاك الاثم یقترف |

یانی: ئەی کەسێك کەدو کوڕەکەی منت بینیوە، ئەو دو کەسەی وەك دو مرواری لەصەدەفێك خزانەدەر. ئەی ئەو کەسەی دو کوڕەکەی منی بینیوە، ئەو دوانەی مۆخی ئێسقان بون و ئەمڕۆ مێشکی منیان بەبەتاڵی جێهێشتوە. ئەی ئەو کەسەی دو کوڕەکەی منی بینیوە، ئەو دوانەی دڵ و گوێی من بون وئەمڕ دڵی من رفێنراوە. هاوار لەریسوایی ژنێکی سەرگەردان وجەرگ بڕاو و داغدار لەمەرگی دو تازە پێگەیشتوی کەچونکە پێشینان رێگەی خۆیان گرتە بەر، ئەم دوانەیش گرفتاری ریسوایی بون. من بیستم کەبوسر کێردێکی لێوتیژی کردۆتە ئاشنای ڕەگی گەردنی کوڕەکانم. گوناح کاری بەهەمان شێوە رودەدات.

ئەمە قەسیدەیەکی درێژە. کاتێك عەلی هەواڵی کوژرانی ئەو دوانەی بیست، گریا و دواتر لەخوا بۆ لەناو بردنی کوڕی ئەبی ئەرتا پاڕایەوە و وتی: خوایە دین و ئاوزی لێ بستێنەرەوە! دۆعاکەی عەلی کاریگەری دانا وناوز لەمێشکی بوسر پەڕی. لەوەدا گەمە کردن بەشمشێر بو بەتەنیا سەرقاڵی بوسر. داوای شمشێری دەکرد و شمشێرێکی دارینیان بۆ دەهێنا ومەشکەیەکی پڕهەوا کە دەیخستە نێوان قاچەکانی و سواری دەبو و بەشمشێرە دارینەکە لێی دەدا. بەرادەیەك شێتی لەخۆی نیشاندا کەگیانی سپارد.

کاتێك کاروبار لەبەرژەوەندی معاویەدا ئارامیان گرت، عوبەیدالله کوڕی عەباس هاتە لای و بینی کوڕی ئەبی ئەرتا لای ئەو دانیشتوە. ئەو روی کردە بوسر و وتی: حەزم دەکرد ئەو کاتەی دو کوڕەکەمت کوشت، زەوی منی لەبەرابەر تۆ قوت دەکردەوە. بوسر وتی: شمشێرەکەی من بێنن. معاویە گرتی و وتی: خوا ریسوات بکات

چونکە پیرێکی نەزان و نەحمەقیت! سوێند بەخوا ئەگەر شمشێر بەدەستی دەگەیشت سەرەتا منی دەکردە نیشانە! عوبەیدالله وتی: بەڵێ. دواتر بەهەمان شمشێر سەرم دەبڕی.

## درێژەی رووداوەکان

لەم ساڵەدا عەلی و معاویە چەندین نامەیان بۆ یەکتر رەوانە کرد و سەرئەنجام هەردوك لەسەر ئەوە رێککەوتن دەست لەدژایەتی کردنی یەکتر هەڵبگرن، عێراق بۆ عەلی بێت و شام بۆ معاویە، هیچ کام لەم دوانە هێرش نەکەنە سەر سەرزەمینەکانی ئەویتر.

دەستەیەك دەڵێن: بەرێکەوتنی بوسر بۆ حیجاز لەساڵی چل و دو /٦٦٢ زایینی رویدا. بوسر بۆ ماوەی مانگێك لەمەدینە مایەوە و بەردەوام لێکۆڵینەوەی لەگەڵ خەڵك دەکرد و هەر کەس ناوی بەبەشداری کردن لەکوشتنی عوسمان دەزرا، بێ بەزەییانەی دەیکوشت.

## کۆچ کردنی کوڕی عەباس لەبەسرە

بەوتەی زۆربەی مێژوونوسەکان، لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی عەباس لەبەسرە ڕۆشتەدەر و پەیوەستی مەککە بو. دەستەیەك ئەم گێڕانەوەیە بەناڕاست دەزانن و دەڵێن: ئەو بەنوێنەرایەتی عەلی فەرمانداری بەسرە بو تا ئەو کاتەی عەلی کوژرا. لەئاشتی کردنی حەسەن لەگەڵ معاویە ئامادە بو و دواتر ڕۆشتە مەککە. گێڕانەوەی یەکەم ڕاسترە. ئەوەی لەکاری ئاشتی کردنی حەسەن و معاویە ئامادە بو، عوبەیدالله کوڕی عەباس بو.

هۆکاری ڕۆشتنەکەی ئەوەبو ڕۆژێك عەبدالله لای ئەبوئەلسوەدی دوئەلی تێپەڕی و وتی: ئەگەر لەچوارپێکان دەبویت، دەبویتە وشتر و ئەگەر شوان دەبویت، نەدەگەیشتیتە لەوەڕگا. ئەبوئەلسوەد نامەی بۆ عەلی نوسی: دوای سڵاو، خوای بەرێز و رێزدار تۆی کردۆتە فەرمانڕەوایەکی بەهێز و شوانێکی بەختەوەر. ئێمە تۆمان تاقی کردەوە و بینیمان لەپاراستنی ئەمانەت کەسێکی گەورەیت و بەردەوام چاکەی خەڵکت دەوێت و

پاسەوانی سەرکەوتن ورزگاری ئەوانیت. بەشی ئەوان بێ کەم و کوڕی بەوان دەبەخشی، خۆت لەکاروباری ئەم دنیا بەدور دەگریت، سامانی ئەوان ناخۆیت و لەداوەری کردنی ئەوان بەرتیل وەرناگریت. هەمانا کوڕە مامەکەی تۆ، شاراوە لەتۆ، هەرچی لەژێر دەستیدا بوە، خواردویەتی و من نەمتوانی ئەمە لەتۆ بشارمەوە. خوا لەتۆ خۆش بێت، لەم کارە بڕوانە و بۆچون و باوەڕی خۆت بەوشێوەی دڵخوازی خۆتە، بنوسە. سڵاو و ماڵئاوا.

عەلی بۆی نوسی: دوای سڵاو، کەسێکی وەك تۆ بۆ ڕێبەر و خەڵك چاکەخوازی دەکات و ڕێز لەراستی و دروستی دەگرێت. سەبارەت بەنامەکەت، نامەم بۆ هاورێکەم نوسی بەلاَم لەقسەکانی تۆ ئاگادارم نەکردەوە، درێغی لەوە مەکە هەرچی لەوێ دەیبینی و دەزانی هۆکارێکە بۆ بەختەوەری و رزگاری خەڵکان، منی لێ ئاگادار بکەرەوە چونکە بۆ ئەم کارە شیاویت و ئەمە حەقێکە لەئەستۆی تۆدایە. سڵاو و ماڵئاوا.

هەروەها سەبارەت بەم کارە بۆ کوڕی عەباسی نوسی. کوڕی عەباس بەمشێوەیە وەلاَمی دایەوە: دوای سڵاو، ئەوەی بەتۆ گەیشتوە، ناڕاست و هەڵەیە، من بۆ ئەوەی لەژێر دەستمدایە، پارێزەر و پاسەوانم. باوەڕ بەگومانەکان مەکە. سڵاو و ماڵئاوا. عەلی نوسی: دوای سڵاو، سەبارەت بەوەی وەك باج وەرتگرتوە، ئاگادارم بکەرەوە کە لەکوێ وەرگیراوە و لەکوێ هەڵگیراوە. کوڕی عەباس نوسی: دوای سڵاو، ئاگادار بومەوە، ئەوەی بۆ تۆیان باس کردوە، بەگەورە و مەترسیداری دەزانی. ئەم سامانەم لەخەڵکی ئەم شارە بەدەست هێناوە. ئێستا هەر کەسێك پێتخۆشە بۆ فەرمانڕەوایی ئەم شارە ڕەوانە بکە چونکە من کۆچ دەکەم. سڵاو و ماڵئاوا.

ئەو خاڵەکانی خۆی لەبەنی هیلال کوڕی عامر بانگ کرد. خەڵکانی قەیس هەمو لەدەوری کۆبونەوە. ئەوسامانەکانی هەڵگرت و وتی: ئەمانە ڕۆژی ئێمەیە و لای تۆ کۆبوتەوە. خەڵکانی بەسرە شوێنی کەوتن و لە(تف) پێی گەیشتن وهەوڵیاندا سامانەکانی لەدەست دەربێنن. خەڵکانی قەیس وتیان: سوێند بەخوا تا یەك کەس لەئێمە زیندو بێت، کەس دەستی بەو سامانە ناگات. صەبرە کوڕی شەیبانی حودانی وتی: ئەی خەڵکانی ئەزد، خەڵکانی قەیس، برا و دراوسێ و هاورێی ئێمە لەبەرابەر

دوژمنانن. ئەوەی لەم سامانە بەنێوە دەگات، کەمە و جیاواز لەوە، خۆیان لەسامانەکان بۆ ئێوە باشترن. ئەوان بەقسەکانی رازی بون و فەرمانیان برد و گەڕانەوە. خەڵکانی بەکر و عەبدولقەیس گەڕانەوە وبەنی تەمیم شەڕیان لەگەڵ کردن. ئەحنەف کوڕی قەیس ویستی رێگەی ئەم کارەیان لێ بگرێت بەلآم بەقسەکانی رازی نەبون و ئەو خۆی لەوان دورخستەوە و خەڵك ئەوانیان لەیەك جیا کردەوە و کوڕی عەباس بەرەو مەککە بەرێکەوت.

## کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تالب

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئەبی تالب کوژرا. لەمانگی رەمەزان دوای حەفدە رۆژ /٢٤ ژانویەی ٦٦١ زایینی یا ١٨ ژانویە یا ٢٤ ژانویە کوژرا. دەستەیەك وتویانە لەمانگی رەبیع الاولی ساڵی چل /ژوئیەی ٦٦٠ زاینی کوژرا. گێڕانەوەی یەکەم راسترە.

ئونس کوڕی مالك دەڵێت: جارێك عەلی نەخۆش کەوت. رۆشتمە لای و بینیم ئەبوبەکر و عومەر لای ئەو دانیشتون. دانیشتم. پێغەمبەر هاتە ناو و سەیری روخساری کرد. ئەبوبەکر و عومەر وتیان: ئەی پێغەمبەر، سوێند بەخوا نەخۆشیەکەی بەمەرگ کۆتایی دێت. پێغەمبەر وتی: ئێستا نامرێت، کاتێك دەمرێت دڵی پڕبێت لەخەم و تورەیی و پەژارە. ئەو دەکوژرێت و ئەوسا ماڵئاوایی لەم جیهانە دەکات.

زۆربەی مێژوونوسان دەگێڕنەوە عەلی بەردەوام دەیوت: بۆ بەدبەخترین کەسی ئێوە ناییێت ئەمە بەمە سور بکات (یانی ریشم بەخوێنم سور بکات)

عوسمان کوڕی موغەیرە دەڵێت: کاتێك مانگی رەمەزان هات، عەلی ئەم شێوازەی گرتەبەر کەشەوێك لەماڵی حەسەن نانی دەخوارد و شەوێك لەماڵی حسێن و شەوێك لەماڵی باوکی جەعفەر. زیاتر لە سێ پاروی نەدەخوارد و دەیوت: دەمەوێت لەکاتێکدا فەرمانی خوا بەم من دەگات، سکم لەخواردن خاڵی بێت، یەك یا دو شەوم ماوە. هێشتا شەوێك بەسەر نەچبو، کوژرا.

حەسەن کوڕی کەسیر لەباوکی دەگێڕێتەوە کەوتی: عەلی لەکاتی بەرەبەیانی زو لەماڵەکەی هاتەدەر و بینی دەستەیەك قاز لەبەرابەری دەرکەوتن و باڵیان رادەوەشاند

و دەیانقیژاند. کەسانی دەوروبەری قازەکانیان دور کردەوە. وتی: دوریان مەخەنەوە، با شێعری مەرگ بڵێن. هەمان شەو کوڕی مولجەم کوشتی.

ئەو ڕۆژەی عەلی کوژرا، حەسەن کوڕی عەلی وتی: دوێ شەو ڕۆشتمە لای و بینیم باوکم لەشوێنی نوێژەکەی لەخوا دەپاڕێتەوە. کاتێك منی بینی، وتی کوڕم دوێ شەو بەئاگا مامەوە و کەسانی بنەماڵەکەم لەخەو هەڵدەستاند چونکە شەوی هەینی بو و بەرەبەیانەکەی ساڵرۆژی شەڕی بەدر. بۆ ماوەیەك خەو چاوەکانی داگرتم وپێغەمبەر لەبەرچاوم دەرکەوت. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چەندە خراپەکاری و تاوان و دوژمنایەتی کە لەئومەتەکەی تۆ بینیم! وتی: لەخوا بپارێرەوە. وتم: ئەی خوایە، لەجیاتی ئەوان کەسانێکی باشتر بەمن ببەخشە و لەجیاتی من خراپترین کەس بکەرە فەرمانڕەوایی ئەوان! کوڕی ئەباج هاتە لای وبۆ نوێژ بانگی کرد. ئەو ڕۆشتەدەر و من بەدوای ئەو. کوڕی مولەجەم لێیدا و کوشتی. هەر کاتێك کوڕی مولجەمی دەبینی، دەیوت:

اريد حياتة و يريد قتلى عذيرك من خليلك من مراد

یانی: من ژیانم لەتۆ دەوێت و ئەو بەدوای مەرگی مندا دەگەڕێت. بیانوگری تۆ لەهاورێکانی تۆ لەهۆزی مورادە.

هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بو عەبدولرەحمان کوڕی مولجەمی مورادی و بورەك کوڕی عەبداللە تەمیمی سورەیمی و عەمرۆ کوڕی بەکری تەمیمی سەعدی، هەرسێکیان لەخەواریج کۆبونەوە و سەبارەت بەکار و چارەنوسی خەڵك گفتوگۆیان کرد و ئاماژەیان بەخراپی فەرمانڕەواکانی خۆیاندا. ئەوان بیری ئەهرەوانیەکان کەوتنەوە و دڵیان بۆ ئەوان سوتا و وتیان: دوای ئەوان چ سودێك لەم ژیانە. باشترە گیانی خۆمان بەخوا بفرۆشین و ڕێبەرە گومراکان بکوژین و وڵات لەوان ئاسودە و رزگار بکەین. کوڕی مولجەم وتی: عەلی بۆ من (ئەو میسری بو)، بورەك کوڕی عەبداللە وتی: معاويە بۆ من، عەمرۆ کوڕی بەکر وتی: عەمرۆ عاصیش بۆ من.

ئەم سیانە سوێندیان خوارد و پەیمانیان بەست هیچ کامیان دەست لەکەسە ئاماژە پێدراوەکان هەڵنەگرێت و نەگەڕێتەوە تا دەیکوژێت یا لەم ڕێگادا دەکوژرێت. شمشێرەکانی خۆیان هەڵگرت و ژەهراویان کرد و بڕیاری حەقدەی ڕەمەزانیان دا. هەر

کام ئاهەنگی مەبەستەکەی خۆی کرد. کوڕی مولجەم ڕۆشتە کوفە و سەردانی هاوڕێکانی خۆی کرد و مەبەستەکەی خۆی لەوان شاردەوە. ڕۆژێك هاوڕێکانی خۆی لە تیم ئەلرەباب بینی کەعەلی لەشەڕی خەواریج دەستەیەك لەوانی کوشتبو. ئەوان بیری کوژراوەکانی شەڕی نەهرەوان کەوتنەوە. کوڕی مولجەم لەگەڵ ئەوان ژنێکی بەناوی قیتام بینی کە باوك و براکەی لەشەڕی نەهرەوان کوژرابون. ژن جوانیەکی سەرسوڕهێنەری بو، کاتێك ئەوی بینی عاشقی بو و خوازبێنی لێکرد. ژن وتی: بەشت نادەم تا دڵم چاك بکەیتەوە. کوڕی مولجەم وتی: چیت دەوێت؟ ژن وتی: سێ هەزار بەرگی زێر یا زیو و کۆیلەیەك و کەنیزێك و کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالب. کوڕی مولجەم وتی: کوشتنی عەلی، گومان هەیە ئەو کارەت بەمن پێشنیار کردبێت. ژن وتی: گومانت نەبێت و بەراستی ئەو کارەم بەتۆ پێشنیار کردوە. هەوڵ بدە لەناکاو دەستت بەو بگات. ئەگەر بیکوژیت دڵی من و خۆت ئاسودە دەکەیت و ژیانت لەگەڵ من ڕەوا دەبێت. و ئەگەر کوژرایت، ئەوەی لای خوایە، لەهەمو شتەکانی ئەم جیهانە ئەمرتر و خۆشترە. کوڕی مولجەم وتی: سوێند بەخوا تەنیا بۆ کوشتنی کوڕی ئەبی تالب بۆ ئەم شارە هاتوم، ئەوەی داوای دەکەی، بەتۆی دەبەخشم. ژن وتی: هاوەڵت بۆ بدۆزمەوە تا یار و پشتیوانی تۆ بن. ژن ناردی بەدوای پیاوێك لەخەڵکەکەی خۆی بەناوی وەردان و لەمبارەوە گفتوگۆی لەگەڵ کرد وپیاوەکە ڕازی بو. لەم لاوە کوڕی مولجەم ڕۆشتە لای پیاوێك لەهۆز ئەشجەع بەناوی شەبیب کوڕی بەجەرە و پێی وت: دەتەوێت کارێك بکەیت ببێتە هۆکاری شەرەف بۆ ئەم دنیات و ئەو دنیات؟ پرسی: چ کارێك؟ کوڕی مولجەم وتی: کوشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالب. شەبیب وتی: دایکت لەپرسەتا دانیشێت. کارێکی گران و مەترسیدار باس دەکەیت! چۆن دەتوانی بیکوژیت؟ . کوڕی مولجەم وتی: لەسەر ڕێگەی مزگەوت بۆی دادەنیشین و کاتێك بۆ نوێژ بێتەدەر، پەلاماری دەدەین و خوێنی دەرێژین. ئەگەر ڕزگارمان بێت، گیانمان ئاسودەیە وئەگەر لەم ڕێگادا بکوژرێین‌ئەوەی لای خوایە، لەهەمو شتەکانی ئەم جیهانە باشترە. شەبیب وتی: هاوار لەتۆ! ئەگەر جگە لەعەلی دەبو، ئاسان بو. تۆ پێشینەی ئەو و زانست و ڕەنج وئەزمونی ئەو لەڕێگەی ئیسلامدا دەزانیت و من ناتوانم بەکوشتنی ئەو ڕازی بم. کوڕی مولجەم وتی: مەگەر ئەو ئەبو بەندە شیاوەکانی خوای لەشەڕی نەهرەوان

کوشت؟ وتی: بەڵێ. وتی: کەواتە لەبەرابەر یارانی خۆمان دەیکوژین. شەبیب رازی بو.

کاتێك شەوی هەینی گەیشت، شمشێرەکەی خۆی هەڵگرت و شەبیب و وەردانی لەگەڵ خۆی برد. ئەوان لەسەر رێگاکەی عەلی دانیشتن، کاتێك عەلی بۆ نوێژ هاتەدەر، هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، بۆ نوێژ هەستن، بۆ نوێژ هەستن؟! شەبیب بەشمشێر لێیدا. شمشێرەکە لەبازوی چەقی. کوڕی مولجەم شمشێری بەرز کردەوە و لەتەوقەسەری دا و وتی: فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا ئەتۆ و هاورێکانت. وەردان هەڵات و بۆ ماڵ گەڕایەوە. یەکێك لەکەسەکانی هاتە لای و وەردان لەهەمو شتێك ئاگاداری کردەوە. پیاو ڕۆشت و شمشێرەکەی خۆی هێنا و ئەوەندە لەوەردانیدا تا کوشتی. شەبیب لەتاریکیدا نوقم بو و هاواری فریاکەوتنی خەڵك بەرز بویەوە. پیاوێك لەحەزرەمەوت بەناوی عومەیمێر ئەوی بینی و هێشتا شمشێرەکە لەدەستیا بو. شمشێرەکەی لێ سەند و لەسەر سینەی دانیشت. کاتێك پیاوی حەزرەمی بینی، خەڵك بەدوای تاوانبارەکاندا دەگەڕێن، لەگیانی خۆی ترسا و ئازادی کرد. شەبیب لەقەرەباڵغی خەڵك رایکرد.

کاتێك کوڕی مولجەم بەشمشێر لەعەلیدا، وتی: ئاگادار بن ئەم پیاوە لەدەستتان رانەکات. خەڵك هێرشیان کردەسەر و گرتیان. عەلی هاتە دواوە و جەعدە کوڕی هوبەیرە کوڕی خوشکی دایکی هانی هەنگاوی بردە پێش و نوێژی بەیانی لەگەڵ خەڵك خوێند. عەلی وتی: ئەو پیاوە بێننە لای من. ئەویان بردە لای. وتی: ئەی دوژمنی خوا! مەگەر چاکەم لەگەڵ تۆ نەکرد! مەگەر باشی تۆم نەدەویست؟ وتی: بەڵێ. پرسی: چ هۆکارێك ناچاری کردیت؟ وتی: چل بەرەبەیان تیژم دەکرد و لەخوا دەپاڕامەوە خراپترینی ئافرێنراوەکانی بەم شمشێرە بکوژێت. عەلی وتی: خۆت بەوە بکوژرێیت چونکە خراپترین ئافرێنراوی خواییت. دواتر وتی: گیان لەبەرابەر گیان. ئەگەر مردم، بیکوژن بەهەمان شێوە کەمنی کوشت وئەگەر زیندو مامەوە، زیندانی بکەن تا بزانم دەبێت چی لەگەڵدا بکرێت. ئەی بنەماڵەکانی عەبدولموتەلیب لەناو خوێنی موسوڵمانەکان مەلەمەکەن و بڵێن (سەرومری باوەڕدارانیان کوشت). ئاگاداربن تەنیا بکوژەکەم لەجیاتی من بکوژرێت. ئەی حەسەن، ئەگەر بەم زەربەیە مردم، یەك زەربەی لێبدەن، هیچ کات ئەشکەنجەی مەکەن یا لوت و گوێچکەی مەبڕن چونکە

لەپێغەمبەرم بیست دەیوت: لەبڕینی ئەندامەکان خۆتان بەدور بگرن هەرچەند قاچی سەگی هار لەئارادا بێت.

ئەم گفتوگۆیانە دەکرا و کوڕی مولجەم دەست بەستراو ئامادە بو. لەم کاتەدا دایکی کولسوم کچی عەلی وتی: ئەی دوژمنی خوا، باوکم ترسی نیە و خوا تۆ ریسوا وسوك دەکات! کوڕی مولجەم وتی: کەواتە بۆ کێ دەگرییت؟ سوێند بەخوا ئەم شمشێرەم بەهەزار درەم کڕی و بەهەزار درەم ژەهراویم کرد. ئەگەر ئەم شمشێرەم لەمیسریەکان دەدا، یەك کەس لەوان زیندو نەدەمایەوە.

لەم کاتەدا جوندەب کوڕی عەبدالله هاتە لای عەلی و وتی: ئەگەر تۆ لەدەست بدەین، لەگەڵ حەسەن بەیعەت دەکەین؟ عەلی وتی: نە فەرمانی ئەو کارەتان پێدەدەم نەدەبمە ڕێگر لەبەردەمتان. خۆتان بیناترن. دواتر حەسەن و حسێنی بانگ کرد و وتی: پێشینیارتان پێدەکەم بۆ خۆپارێزی، بەوەی بەشوێن مەبەستەکانی ئەم جیهانەدا نەگەڕێن هەرچەندە بەدوای ئێوەدا بگەڕێت، بۆ ئەو شتەی لەدەستی دەدەن، مەگرین، زمان تەنیا بۆ وتنی ڕاستی و دروستی بکەنەوە، بەزەییتان بەهەتیودا بێتەوە، بۆ ئەو دنیا تێبکۆشن، بۆ ستەمکار دوژمن و پشتیوانی ستەملێکراو بن، نوسراوەکانی خوا ئەنجام بدەن و لەڕێگەی خوادا لەسەرکۆنە کردنی هیچ کەسێك مەترسن. دواتر روی کردە محەممەد کوڕی حەنیفە و وتی: ئایا ئەو وەسیەتەی بۆ براکانتم کرد، بەبیرت سپارد؟ وتی: بەڵێ. عەلی وتی: وەك ئەوان پێشنیار بەتۆ دەکەم و جیاواز لەوە پێشنیارت پێ دەکەم ڕێزی هەر دوکیان بگریت چونکە حەقێکی گەورەیان لەئەستۆی تۆداهەیە، گوێ لەفەرمانەکانی ئەوان بگرە و بێ ڕاوێژ کردن بەوان هیچ کارێك ئەنجام مەدە. دواتر بەحەسەن و حسێنی وت: پێشنیارتان پێدەکەم بەباشی هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەن چونکە برا و کوڕی باوکی ئێوەیە و بەباشی دەزانن چەندەم خۆش دەوێت. بەحەسەنی وت: کوڕەکەم، پێشنیار دەکەم لەخوا ترس بیت و بەردەوام نوێژەکان لەکاتی خۆیدا جێبەجێ بکەیت، زەکات بێ کەم و کوڕی بدەیت، بەجوانی دەستنوێژ بگریت چونکە تەنیا بەو شێوە، خوای گەورە بەنوێژ ڕازی دەبێت، پێشنیارت پێدەکەم بەبەخشینی گوناحی کەسانیتر، تورە نەبون، ڕاگرتنی پەیوەندی خزمایەتی، قوڵبونەوە لەزانستە دینیەکان و بەدواداچونی کارەکان، بەردەوام لەگەڵ

قورئاندا بون، ڕێز گرتن لەدراوسێ، فەرماندان بەئەنجامدانی کاری چاکە و دورخستنەوەی خەڵکان لەکاری خراپ و نەشیاو و ناپەسەندەکان.

ئەوسا وەسیەتی خۆی نوسی و هیچ وتەیەکی نەهێنایە سەر زمان جگە لەوەی بەردەوام لەژێر لچەوە دەیوت: خوایەك جگە لەخوا نیە. خوای لێی ڕازی بێت و ڕازی بکات.

حەسەن و حسێن و عەبداللە کوڕی جەعفەر شۆردیان. ئەویان لەسێ کفنەوە ئالاند کەکراسی لەگەڵدا نەبو. حەسەن حەوت جار تەکبیری بۆ وت.

کاتێك گیانی سپارد، حەسەن کەسێکی بەدوای کوڕی مولجەمدا نارد و هێنای. کوڕی مولجەم وتی: دەتەوێت کارێکت بۆ بکەم؟ سوێند بەخوا لەگەڵ خوا پەیمانم بەستوە هیچ قسەیەك نەکەم جگە لەوەی ئەو کارە ئەنجام بدەم. من لەشوێنی (حەتیم) پەیمانم لەگەڵ خوابەست، عەلی و معاویە بکوژم یا لەم ڕێگادا بکوژرێم، ئەگەر دەتەوێت ئازادم بکە و سوێند و پەیمانی خوایی لەئەستۆی مندا بێت ئەگەڕێمەوە تا معاویە دەکوژم و ئەگەر کوشتم و زیندو مامەوە، دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ و دەستەدەخەمە ناو دەستی تۆ. حەسەن وتی: سوێند بەخوا ئازاد نابیت تا بەسەرەوە دەکەویتە ناو جەهەننەم. دواتر ئەوی برد و کوشتی. خەڵك جەستەی کوڕی مولجەمیان هەڵگرت و گریان تێ بەردا.

عەمرۆ کوڕی ئەصەم دەڵێت: بەحەسەن کوڕی عەلیم وت: شوێنکەوتوانی ئێوە گومان دەکەن عەلی پێش ڕۆژی هەستانەوە حەشر دەکرێت! وتی: سوێند بەخوا ئەوان درۆ دەکەن. چونکە ئەگەر دەمانزانی پێش ڕۆژی هەستانەوە، هەڵدەستێنەوە، هاوسەرکانیمان بەشو نەدەدا و سامانەکەیان دابەش نەدەکرد.

ئەوەی وتی: شوێنەکەتوان بێ گومان مەبەستی لەدەستەیەك لەوانە چونکە هەمو شوێنکەوتوانی عەلی ئەو باوەڕەیان نیە، دەستەیەکی کەم لەوان ئەوباوەڕەیان هەیە کە لەناودارەکانیان جابر کوڕی یەزیدی جوعفی کوفی بو. تا ئەو شوێنەی دەزانین، ئەم دەستەیە لەناوچون.

## درێژەی داستانەکە

بورەك كوڕی عەبداللە لەو شەوەی بەشمشێر لەعەلیاندا، لەسەر رێگەی معاویە دانیشت. کاتێك معاویە بۆ نوێژی بەیانی هاتەدەر، بەشمشێرەوە پەلاماریدا بەڵام شمشێرەکەی بەر سمتی کەوت. ئەویان گرت. وتی: هەواڵێکم پێیە پێی شادمان دەبیت. ئەگەر ئاگادارت بکەمەوە ئایا سودی منی تیا دەبێت؟ وتی: بەڵێ. یەکێك لەبراکانم ئەمشەو عەلی کوشتوە. معاویە وتی: ئەگەری هەیە نەیتوانیبێت. بورەك وتی: بێ گومان توانیویەتی، چونکە عەلی هیچ کات پاسەوان بۆ خۆی دانانێت. معاویە فەرمانیدا و کوشتیان.

معاویە کەسێکی بەدوای ساعیدیدا رەوانە کرد کەپزیشکی ئەو شارە بو. کاتێك پشکنینی وردی بۆ کرد وتی یەکێك لەم دو کارە هەڵبژێرە. یا ئاسنێك سور دەکەمەوە و دەیخەمە شوێنی شمشێرەکە، یا دەرمانێکت دەرخوارد دەدەم و چاك دەبیتەوە بەڵام منداڵت نابێت چونکە شمشێری ئەو پیاوە ژەهراوی بوە. معاویە وتی: بەرگەی ئاگر ناگرم بەڵام یەزید و عەبداللە بەئەندازەی پێویست روناکی چاوی منن. پزیشك دەرمانەکەی دەرخواردداو چاك بویەوە بەڵام دوای ئەوە منداڵی نەبو.

لەم کاتەدا معاویە فەرمانیدا خێوەتێکی بۆ دروست کەن و پارێزگاری لێ بکەن و شەوانە حەسحەسەکان بەملاولادا رەوانە بکەن و کاتێك بۆ نوێژ سەر دەخاتە سەر زەوی چەند کەسێك لەدەوروبەر بیپارێزن. ئەو یەکەم کەس بو لەئیسلام ئەم شێوەی بەکار برد. دەستەیەك دەڵێن: معاویە بورەکی نەکوشت بەڵکو فەرمانیدا و دەست وقاچیان بڕیەوە. ئەو بەزیندویی مایەوە تا زیاد کوڕی ئوبیە بو بەفەرمانداری کوفە. بورەك لەوێ بو و چەندین منداڵی هێنابوە دنیا. زیاد پێی وت: تۆ دەتوانی منداڵ بێنیتە دنیا و سەرومری باوەڕداران لەزیانی تۆ نەزۆکە. ئەوی کوشت و لەداریدا.

بەڵام عەمرۆ کوڕی بەکر، لەو شەوەدا لەسەر رێگەی عەمرۆعاص دانیشت بەڵام عەمرۆ نەهاتەدەر چونکە ئازاری سکی بو. ئەبوخارجە کوڕی ئەبی حەبیبە سەرکردەی پاسەوانەکانی لەبەنی عامر، فەرمانیدا بڕوات و لەجیاتی ئەو نوێژ بخوێنێت. عەمرۆ کوڕی بەکر هێرشی کردە سەر و گومانی دەکرد عەمرۆعاصە. لەویدا

و کوشتی. خەڵك ئەویان بردە لای عەمرۆعاص و سلاّویان لەفەرماندار کرد. عەمرۆ کوڕی بەکر وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: عەمرۆعاص. وتی: کەواتە من کێم کوشت؟ وتیان: خارجە. وتی: ئەی پیاوی فێزەون سوێند بەخوا گومانم دەکرد تۆم کوشتوە. عەمرۆعاص وتی: تۆ منت دەویست و خوا خارجە. ئەوی کوشت.

کاتێك هەواڵی کوژرانی عەلی بەعایشە گەیشت، وتی:

فالقت عصاها و استقر بها النوی كما قر عينا بالاياب المسافر

یانی: ئەو ژنە داردەستەکەی بەجێهێشت و لەماڵەوە دابەزی و ئارام بویەوە. بەهەمان شێوە کەرێبوارێك لەرێگای دورەوە دەگات وچاوەکانی رون دەبێتەوە.

دواتر پرسی: چ کەسێك ئەوی کوشتوە؟ وتیان: پیاوێك لەموراد. عایشە وتی:

فان يك نائيا فلقد نعاه نعی ليس فی فيه التراب

یانی: ئەگەر دورکەوتۆتەوە، کەسێك هەواڵی مەرگی بێنێت کەفوڕ بەدەمی نەبێت.

زێنەب کچی ئەبی سەلە وتی: ئایا ئەمە سەبارەت بەعەلی دەڵێیت؟ عایشە وتی: من فەرامۆشکارم، هەر کات شتێکم لەبیر کرد، بیرم بخەنەوە.

کوڕی ئەبی مەیاسی موڕادی وتی:

فنحن ضربنا يا لك الخير حيدرا ابا حسن مامومة فتفطرا

و نحن خلعنا ملكة من نظامه بضربة سيف اذ علا و تجبرا

و نحن كرام فی الصباح اعزة اذا المرء بالموت ارتدی و تازرا

یانی: ئەی هاورێ چاکە هاورێی تۆ بێت، ئێمە تیغێکی تیژمان لەحەیدەر باوکی حەسەندا کە لەزیانەکەی تەوقە سەری قەڵشا و لەت لەت بو. کاتێك بەشوێن بڵندایی دەگەڕا و گەردن کێشی دەکرد، ئێمە ڕشتەی پاشایەتی ئەومان لەبناغەوە هەڵتەکاندا و روخاندمان. کاتێك هەر کەسێك جل و بەرگی مەرگ لەبەر بکات، ئێمە ڕێزدارانین کە لەبەرەبەیانان هێرش دەکەین.

هەروەها وتی:

ولم ار مهرا ساقه ذو سماحة كمهر قطام بين عرب و معجم

ثلاثة الاف و عبد و قينة و ضرب علی بالحسام المصمم

فلامهر اغلامن علی و ان غلا و لا فتك الا دون فتك ابن ملجم

یانی: هیچ مارەییەك لەنێوان عەرەبەكان و عەجەمەكان كە بەخشەرێك بۆ ماڵی ژنە جوانەكەی بردبێت، گرانتر لەمارەیی قتام نیە. سێ هەزار درەم و كۆیلەیەك و كەنیزێك و كوشتنی عەلی بەشمشێری بریقەداری گیان ستێن. هیچ مارەییەك هەرچەندە گرانبایی بێت، لەعەلی گرانبایتر نیە، و هیچ كوشتنێك لەئارادا نیە مەگەر كە لەشمشێر وەشاندی لەناكاوی كوڕی مولجەم سوكتر بێت.

ئەبوالاسوەدی دوئەلی سەبارەت بەكوژرانی عەلی وتی:

الا ابلغ معاوية بن حرب    فلا قرت عيون الشامتينا
افی شهر الصيام فجعتمونا    بخير الناس طرا اجمعينا
قتلتم خير من ركب المطايا    و رحلها و من ركب السفينا
و من لبس النعال و من حذاها    و من قرء المثانی و المئينا
اذا استقبلت وجه ابی حسن    رايت البدر راع الناظرينا
لقد علمت قريش حيث كانت    بانك خيرها حسبا و دينا

یانی: لەمنەوە پەیامێك بۆ معاویە كوڕی حەرب ببەن (نەكا چاوی سەركۆنەكەران شاد بێت) ئایا لەمانگی ڕۆژو داغی باشترینی هەمو خەڵكانتان خستە سەر دڵی ئێمە و ئێمەتان پرسەگێڕی ئەو كرد؟ ئێوە باشترین كەستان كوشت كەسوار ئەسپ بوبێت، باشترین كەس باری خستبێتە سەر مایین، و باشترین كەس كە لەكەشتیدا دانیشتبێت، باشترین كەسێك كەپێڵاوی لەپێ كردبێت، و باشترین كەس كەئەندازەیەكی گێڕاوی بڕیبێت و باشترین كەس كەیەكەم بەشی قوڕئان وسەد بەشی خوێندبێت. كاتێك پێشوازی لەروخساری باوكی حەسەن دەكەیت، مانگی شەوی چواردە دەبینیت كەبینەران سەرسام دەكات. قوڕەیشیەكان لەهەر شوێنێك بن دەزان تۆ لەروانگەی ئەژاد و دین و ئایین، باشترینی هەموانیت.

بەكر كوڕی حەسادی باهری وتی:

قل لابن ملجم و الاقدار غالبة:    هدمت للدين و الاسلام اركانا
قتلت افضل من يمشی علی قدم    و اعظم الناس اسلاما و ايمانا
و اعلم الناس بالقران ثم بما    سن الرسول لنا شرعا و تبيانا
صهر النبی و مولاه و ناسره    اضحت مناقبه نورا و برهانا

و كان منه على رغم الحسود له مكان هارون من موسى بن عمرانا
ذكرت قاتله و الدمع منحدر فقلت سبحان رب العرش سبحانا
انى لا حسبه ما كان من انس كلا و لكنه قد كان شيطانا
قد كان يخبرهم هذا بمقتله قبل المنية ازمانا فازمانا
فلا غفا الله عنه سوء فعلته و لا سقى قبر عمران بن حطانا
يا ضربة من شقي ما اراد بها الا ليبلغ من ذى العرش رضوانا
بل ضربة من شقي اوردته لظى و سوف يلقى بها الرحمان غضبانا
كانه لم يرد قصدا بضربته الا ليصلى عذاب الخلد نيرانا

یانی: بە كوڕی مولجەم بڵێ (چارەنوسەكان بەردەوام بەسەر هەمو شتێكدا زاڵن) تۆكۆڵەكەی دین و ئیسلامت دارماند. باشترین كەسێك كەهەنگاو بخاتە سەر زەوی، لەناوت برد، باشترینی خەڵكان لەروانگەی ئیسلام و باوەڕ بەكردار. زاناترینی خەڵكان بۆ قورئان و زاناترینی خەڵكان بۆ ئەو سونەتانەی پێغەمبەر بناغەی بۆ دارشت و ئایین و دینی پێ روناك كردەوە. زاوای پێغەمبەر و هاورێ و یاری ئەو، كەسێك چاكەكانی بۆتە چرا و روناكی سەر رێگەی خەڵك. بەریسوایی ئەوەی رژدی پێ دەبات و خراپەی دەڵێت، پێگەكەی ئەو یەكسان بو لەگەڵ پێگەی هارون لەبەرابەر موسای كوڕی عیمران. بكوژەكەی ئەوم لەبیرە وبەردەوام فرمێسك لەچاوەكانم دەباری) و دواتر وتم: پاكە پەروەردگار، تەخت و بارەگا پاكە، من ئەم بكوژە بەمرۆڤ دانانێم چونكە ئەو دێوێكی خوێنخۆرە. ئەم پیاوە پێش مەرگی خۆی زەمان بەزەمان ئەوانی لەمەرگی خۆی ئاگادار دەكردەوە.خۆزگە خوا هیچ كات ئەم كارە خراپەی نەبەخشێت و هیچ كات لەسەر گۆڕی عیمران كوڕی حەتان بارانی خۆشەویستی نەبارێنێت. شمشێر وەشاندن لەپیاوێكی خراپەكار كەگومانی دەكرد بەم كارە رەزامەندی خوا بەدەست دێنێت. ئەمە شمشێرە وەشاندی پیاوێكی خراپەكار بو كەخۆی خستە ناو ئاگرەوە و كاتێك روبەروی خوا دەبێتەوە، بەتوڕە، دەیبینێت. وەك بڵێی لەم شمشێر وەشاندنە تەنیا ئەوەی دەویست گرفتاری ئاگری جەهەننەم ببێت و تیایدا بمێنێتەوە.

## رۆژگاری خەلافەت و ساڵەکانی تەمەنی ئەو

دەستەیەك دەڵێن: خەلافەتی ئەو سێ مانگ کەمتر لەپێنج ساڵ و ژیانی شەست و سێ ساڵ بو. کەسانیتر دەڵێن: ساڵەکانی ژیانی پەنجا و نۆ یا شەست وپێنج یا پەنجا و هەشت ساڵ بو. وتاری یەکەم راسترە. کاتێك کوژرا، ئەویان لەمزگەوت یا لەکۆشك یا لەشوێنی دیکە بەخاك سپارد. راستتر ئەوەیە ئارامگای ئەو لەوشوێنەیە ئێستا خەڵك دەڕۆنە سەردانی و داوای بەختەوەری ورزگاری لێدەکەن.

## ئەژاد و چۆنیەتی ئەندام و هاوسەران و منداڵەکانی ئەو

ئەسمەر بو، چاوی گەورە، ورگ زل، سینگی توکن، سەرێکی کەم مو، کەمێك کورتە بالا، چوارشانە، بازوی بەهێز، قاچی گەورە، روگەش و بەردەوام بزەیەك لەسەر لێو، ریشێکی پڕ و سپی و هیچ کات رەنگی نەدەکرد.

ئەژادەکەی بەمشێوەیە: عەلی کوڕی ئەبی تالب کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم.

دایکی فاتیمە کچی ئەسەد کوڕی هاشم کوڕی عەبد مەنافە.

ئەو یەکەم خەلیفە بو دایکی و باوکی هەردوك هاشمی بون. تا رۆژگاری ئێمە کەس نەبۆتە خەلیفە دایك و باوکی هەردوکیان هاشمی بن. تەنیا دو کەس و ئەویش یەکیان کوڕەکەی حەسەن و ئەویتریان محەممەد ئەمین کەباوکی هارون ئەلرەشید و دایکی زوبەیدە کچی جەعفەری مەنصور بو.

هاوسەرەکانی ئەمانە بون: یەکەم هاوسەر کەهەڵیبژارد، فاتمە کچی پێغەمبەر و تا ئەو کاتەی لەژیاندا بو، ژنی دیکەی نەهێنا. فاتمە حەسەن و حسێنی هێنایە دونیا. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەفاتمە کوڕێکی دیکە بو بەناوی موحسین و لەمنداڵیدا مرد. کچەکانی لەفاتمە، زێنەبی گەورە و دایکی کولسومی گەورە بون.

دوای فاتمە، دایکی بەنینی کەلابی کچی حەرامی کردە هاوسەری خۆی و ئەم ژنە عەباس و جەعفەر و عەبدالله و عوسمانی هێنایە دنیا کەهەمویان لەکەربەلا و لەگەڵ حسێن کوژران. جگە لەعەباس کەسیان منداڵی نەبو.

هەروەها لەگەڵ لەیلا ئەهشەلی تەمیمی کچی مەسعود کوڕی خالید پەیوەندی

هاوسەری بەست و عوبەیداللە وئەبوبەکری بۆ هێنایە دنیا و ئەمانیش لەگەڵ حسەیندا کوژران. دەستەیەك دەڵێن: عەبداللە بەدەستی موختار لەمەزار کوژرا. دەڵێن: ئەم دوانەیش منالّیان نەبو.

هەروەها ئەمسا کچی عومەیسی خەسعەمی وەك هاوسەر هەڵبژارد و محەممەدی گەورە و یەحیای بۆ هێنایە دونیا و لەمانیش منالّ نەهاتەدنیا. دەستەیەك دەڵێن: محەممەد لە(دایکی منالّ) بو و لەگەڵ حسەین کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: ئەم خاتونە عەونی بۆ هێنایە دونیا.

لەصەهبای تەغلەبی کچی رەبیعە (لەو دیلانەی خالید کوڕی وەلید لەشەڕی عەین ئەلتەمر دەستی کەوت) عومەر کوڕی عەلی و روقیە کچی عەلی هاتنە دنیا. عومەر تا هەشتا وپێنج سالّی مایەوە و نیوەی میراتی عەلی بەرکەوت و لەیەنبوع مرد.

هەروەها عەلی ئومامە کچی ئەبی عاص کوڕی رەبیع کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی عەبد شەمسی کردە هاوسەری خۆی. دایکی زێنەب کچی پێغەمبەری خوا بو. ئەم ژنە محەممەدی نێوەنجی بۆ هێنایە دونیا.

هەورەها عەلی باوکی محەممەدی گەورەیە (محەممەدی حەنیفە) کەدایکی خولە کچی جەعفەر لەبەنی حەنیفەیە.

عەلی دایکی سەعیدی سەقەفی کچی عوروە کوڕی مەسعودی کردە هاوسەری خۆی و ئەم ژنە دایکی کولسومی و رەملەی گەورە و دایکی حەسەنی هێنایە دونیا.

ئەو چەند کچێکی لەژنە بەربلاّوەکانی هەیە و ناویان بەئێمە نەگەیشتوە، وەك: دایکی هانی، زێنەبی بچوك، رەملەی گەورە، دایکی کولسومی گەورە، فاتمە، ئەمامە، خەدیجە، دایکی کەرام، دایکی سەلە، دایکی جەعفەر، جومانە و نەفیسە هەمویان لە(دایکی منالّەکان).

دوبارە لەگەڵ موخەبا کچی ئەمرۆئەلقەیس کوڕی عودەی کەلبی پەیوەندی هاوسەرگیری بەست و کچێکی بۆ هێنایە دنیا بەلاّم بەمنالّی مرد. کچ بۆ مزگەوت دەرۆشتەدەر و خەڵك لێیان دەپرسی، خالّەکانت کێن؟ دەیوت: وە، وە! یانی کەلب (سەگ).

هەمو منالّەکانی عەلی چواردە کور و حەفدە کچ بون. منالّ و ئەو بنەمالّەی بۆ عەلی

مایەوە لەحەسەن و حسێن، محەممەدی حەنیفە و عەباسی کەلبی و عومەری تەغلەبی بون.

## فەرماندارەکانی ئەو

فەرمانداری ئەو لەم ساڵەدا لەبەسرە عەبدالله کوڕی عەباس بو وئاماژەمان بەدژایەتی ئەواندا. ئەو سەرپەرەستی خێرات، فەرماندەی سوپا و یاریدەدەری عەلی لەهەمو کارەکان لەسەراسەری رۆژگاری خەلافەتیدا بو. سەرپەرەستی کاروباری دادی بەسرە لەلایەن عەلیەوە ئەبوئەلاسوەدی دوئەلی بو. زیاد کوڕی نوبیە فەرمانڕەوایەتی فارسی دەکرد، لەیەمەن عوبەیدالله کوڕی عەباس، لەتایف و مەککە و دەوروبەری قوسەم کوڕی عەباس و لەمەدینە ئەبوئەیوبی ئەنساری یا سەهل کوڕی حەنیف.

بەشێك لەهەڵس و کەوت و کردارەکانی ئەو

ئەبو رافیعە کۆیلەی پێغەمبەر، گەنیجنەداری عەلی و پارێزەی گەنجخانەکان بو. رۆژێك عەلی رۆشت و بینی کچەکەی خۆی رازاندۆتەوە. گەوهەرێکی گرانبایی بەکچەکەوە بینی و پێشتر لەگەنجینە بینیبوی. پرسی: کچم ئەمەت لەکوێ هێناوە؟ بێ گومان دەستی دەبڕم، کاتێك ئەبورافع بینی عەلی لەسەر قسەکەی خۆی سورە وبەسەرسەختی دەڵێت، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەخوا من کچەکەم پێ رازاندەوە. عەلی وتی: من پەیوەندی هاوسەریەتیم لەگەڵ فاتیمە بەست و ئێمە جێگەمان ئەبو مەگەر پێستی مەڕێك کەشەوانە لەسەری دەخەوتین و رۆژ لەسەری ئاڵفمان بەوشترە ئاوکێشەکەی خۆمان دەدا. هەمو کارەکانیماڵەوە فاتیمە دەیکرد.

عەبدالله کوڕی عەباس دەڵێت: زانایی خەڵکان پێنج بەش بو و چوار بەشی بەعەلی بڕا و یەك لەسەر پێنجی بۆ خەڵکانی دیکە. عەلی لەو یەك لەسەر پێنجەیش لەگەڵ ئەوان بو بەشەریك و لەوئەندازەیش بو بەیەکەمی هەمو خەڵکان.

ئەحمەد کوڕی حەنبەل دەڵێت: سەبارەت بەهیچ کام لەهاوەڵانی پێغەمبەر بەئەندازەی عەلی کوڕی ئەبی تالب حەدیس نەهاتوە.

عەمرۆ کوڕی مەیمون دەڵێت: کاتێك لەعومەر کوڕی خەتابیان دا و ئەو کاری خەلافەتی بەشەش لەهاوەڵانی پێغەمبەر سپارد و ئەوان لای ئەو رۆشتنەدەر، وتی:

ئەگەر ئەم پیاوە بێ موە بێننە سەر کار، خەڵك بۆ ڕێگەی ڕاستی و دروستی دەبات.
عەبدالله کوڕی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران بۆ ئەوت (عەلی) نەکردە خەلیفە؟
وتی: نامەوێت لەژیان و مەرگ، هەردوك، قەرزاری خەلافەت بم.
عاصم کوڕی کولەیب لەباوکی دەگێڕێتەوە کە: ئەندازەیەك سامانیان لەئیصفەهانەوە بۆ عەلی هێنا. کردی بەحەوت بەش. نانێکی تیا بینی و نانەکەیشی کرد بەحەوت بەش. دواتر سەرکردەی بەشەکانی بانگ کرد و لەنێوان ئەوان تیروپشکی خست تا بزانێت کام یەك لەوان دەبێت پێش ئەوانی دیکە بەشی خۆی هەڵگرێت.
هارون کوڕی عەنتەرە لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەخەورنەق ڕۆشتمە لای عەلی و ئەمە لەوەرزی زستاندا بو. عابایەکی لەخۆی ئالآندبو و دەلەرزی. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند بۆ تۆ و بنەماڵەکەت لەم سامانە بەهرەیەکی دیاری کردوە، بۆ وا لەخۆت دەکەیت؟ وتی: سوێند بەخوا هیچ لەسامانی ئێوە هەڵناگرم و ئەمەیش ئەو عابایە لەمەدینەوە لەگەڵ خۆم هێناومە.
یەحیا کوڕی سەلە دەڵێت: عەلی عەمرۆ کوڕی سەلومەی وەك فەرمانداری ئیصفەهان دەست نیشان کرد. ئەو هاتە لای عەلی و لەگەڵ خۆی ئەندازەیەك سامان و مەشکەی پڕهەنگوین و ڕۆنی هێنا. دایکی کولسوم کچی عەلی کەسێکی نارد و داوای کەمێك ڕۆن و هەنگوینی کرد. ئەو قاپێك هەنگوین و قاپێك ڕۆنی بۆ رەوانە کرد. کاتێك بەیانی گەیشت، عەلی فەرموی ئەو سامان و ڕۆن و هەنگوینە بێنن تا بەسەر خەڵکدا دابەشی بکات. مەشکەکانی بژارد وبینی دوان لەناویاندا کەمە. لەمبارەوە پرسیاری لەعەمرۆ کوڕی سولەمە کرد. ئەو باسی نەکرد و وتی: دەیانهێنین. عەلی سوێندیدا تا ڕاستیەکەی پێ بڵێت. عەمرۆ ڕاستیەکەی بەعەلی وت. عەلی کەسی بۆ لای دایکی کولسوم رەوانە کرد و مەشکە ڕۆن و هەنگوینەکەی وەرگرتەوە بەلآم بینی پڕ نین و لێیان دەرهاتوە. بەبازرگانانی وت ئەو برەی لێی دەرهاتوە، ئەندازە بگرن. بەهاکەیان بەسێ درەم خەملآند. کەسی بۆ لای دایکی کولسوم رەوانە کرد وسێ درەمی لێ سەند و دواتر لەناو خەڵکدا دابەشی کرد.
دەستەیەك دەڵێن: جارێك ڕۆشتە ناو خەڵکانی هەمەدان و بینی دوپیاو بەسەختی لەیەك دەدەن. ئەوانی جیا کردەوە و بەرێگەی خۆیدا ڕۆشت. دواتر هاوارێکی بیست

کەدەڵێت: ئەی خوایە، فریام کەون! بەرەو دەنگەکە غاری کرد و وتی: ئێستا فریاڕەس فریات دەکەوێت. بینی پیاوێك، پیاوێکی دیکەی گرتوە. ئەو پیاوە وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران، کراسێکم بەمپیاوە فرۆشت و پەیمانم لێوەرگرت درەمەکانی کێشەیان نەبێت. ئێستا ئەم درەمانەی بۆ من هێناوە کەدەیانبینیت. ڕۆشتمە لای و گرتم بەلاَم شەقەزللەی لەمندا. بەو پیاوەی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران، ڕاست دەکات. فەرموی: درەمی بێ کێشەی پێ بدە. بەو پیاوەی شەقەزللەی لێدرابو، وتی: دادی خۆتی لێ وەربگرە. وتی: ئەی سەرومری باوەڕداران ئایا دەتوانم بیبەخشم؟ وتی: خۆت دەزانی. دواتر وتی: ئەی موسوڵمانەکان، بیگرن. ئەویان گرت و وەك منداڵێکی قوتابخانە لەسەر پشتی پیاوێك هێنایان. پانزە قامچی لێدا. وتی: ئەمە سزای تۆ لەبەر ئەوەی ڕێزی ئەو پیاوەت شکاند.

کاتێك کوژرا، کوڕەکەی حەسەن وتارێکیدا و وتی: ئێوە لەشەوێکدا پیاوێکتان کوشت قورئان هاتەخوار و عیسا کوڕی مریەم بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە و یوشەع کوڕی نونی تیا کوژرا. سوێند بەخوا، هیچ کام لەپێشینان پێشی نەکەوتون و هیچ کام لەداهاتوان ناگەنە تۆزی ڕێگەی. سوێند بەخوا هەر کاتێك پێغەمبەر بۆ شەڕ ڕەوانەی دەکرد، جبرەئیل پارێزگاری لای ڕاستی دەکرد و میکائیل پارێزگاری لای چەپ. سوێند بەخوا هیچ زێروزیوێکی لەخۆی بەجێنەهێشت مەگەر حەوتسەد یا هەشتسەد درەم کە بۆ کڕینی کەنیزێك پاشەکەوتی کرد.

سوفیان دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالب هیچ خشتێکی نەخستە سەر خشتێکیتر و هیچ قامیشێکی نەخستە سەر قامیشێکیتر (ماڵ یا بینایەکی بۆ خۆی دروست نەکرد). کەمێك گەنمیان لەکێڵگەیەکی بچوك بۆ دەهێنا و هەمانەیەکی پڕنەدەکرد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو شمشێرێکی بردە بازار و فرۆشتی و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر چوار درەمم بۆ کڕینی شەرواڵ دەبو، نەمدەفرۆشت. ئەو لەهاورێ و ئاشناکان هیچی نەدەکڕی و لەگەڵ نەناسراوەکان بازرگانی دەکرد لەترسی ئەوەی ئەوەك شتێکی پێ ببەخشن. کاتێك کراسێکی دەکڕی قۆڵەکانی بەدرێژی دەستی ئەندازە دەگرت و زیادەکەی دەبڕی. مۆری لەو هەمانە ناردە دەدا کەنانی لێدەخوارد و دەیوت: نامەوێت شتێك بچێتە ناو سکم مەگەر ئەو شتەی دەیزانم (نیشانەی دەکرد لەبەر ئەوەی نەکا

کەسێك هەمانەیەکی بەدیاری بۆ بێنێت).

شەعبی دەڵێت: عەلی زرێیەکی خۆی لەدەستی پیاوێکی مەسیحیدا بینی. ئەوی گرت و بردیە لای دادوەرەکەی خۆی شورەیح و لای پیاوی مەسیحی دانیشت و وتی: ئەگەر موسوڵمان دەبو، بەم ئەندازەیە ڕێزم لێ نەدەگرت. بەداوەری وت: ئەم زرێ هی منە! مەسیحی وتی: هی خۆمە و سەروەری باوەڕداران درۆ ناکات. شورەیح بەعەلی وت: شایەتت بۆ قسەکانت هەیە؟ عەلی پێکەنی و وتی: نیمە. مەسیحی زرێکەی هەڵگرت و ڕۆشت و دوای کەمێك گەڕایەوە و وتی: شایەتی دەدەم ئەم شێوە داوەری کردنە تایبەتە بەپێغەمبەران. سەروەری باوەڕداران من بۆ لای داوەرەکەی دەبات و داوەر لەزیانی ئەو حوکم دەدات. دواتر باوەڕی بەئیسلام هێنا و وتی لەکاتی ڕۆشتن بۆ شەڕی صەففین زرێکەی لێ کەوتەخوار و هەڵمگرت. عەلی لەموسوڵمان بونی ئەو شادمان بو و زرێکەی هاوڕێ لەگەڵ ئەسپێك پێشکەش کرد. ئەو پیاوە لەشەڕی نەهرەوان شان بەشانی عەلی شەڕی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: جارێك عەلیان بینی، ئەندازەیەك خورمای لەبوغچەیەکەوە ئاڵاندوە. خورمایە کە بەچەند درەمێك کڕیبوی وبۆ ماڵەوەی دەبرد. یەکێك پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، فەرمان بدە تا بۆت ببەینەوە. وتی: باوکی نانخۆرەکان بۆ بردنەوەی شیاوترە.

حەسەن کوڕی صالح دەڵێت: لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز باسی خۆپارێز و خواپەرەستان هاتە ئاراوە، وتی: یەکەم کەسی ئەوان عەلی کوڕی ئەبی تالبە.

مەداینی دەڵێت: عەلی تاقمێك لەخەڵکانی لەبەر دەرگای ماڵەکەی بینی، لەکۆیلەکەی قەنبەری پرسی: ئەمانە کێن؟ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، شوێنکەوتوانی تۆن. عەلی وتی: بۆ نیشانەی شوێنکەوتوانی منیان پێوە نیە؟ پرسی: نیشانەکەیان چیە؟ وتی: سکیان لەبرسیەتیا بەپشتیانەوە لکاوە، دەمیان لەتینویەتی وشك بوە، وچاویان لەگریانی زۆر ژاکاوە.

کردار وهەڵس و کەوتەکانی ئەو فراوانن. من بەسەرهاتی ژیان و چارەنوسی ئەوم لەنوسراوێکی جیادا کۆکردۆتەوە.

## بەیعەت لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی

لەم ساڵەدا، ساڵی چلەم/٦٦٠ زایینی دوای کوژرانی عەلی، لەگەڵ کوڕەکەی حەسەن کوڕی عەلی بەیعەتیان کرد. یەکەم کەس بەیعەتی لەگەڵ کرد قەیس کوڕی سەعدی ئەنساری بو کەوتی: دەستی خۆت بکەرەوە تا لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەر و شەڕ لەگەڵ پێشێل کەرانی دین وئایین بەیعەت لەگەڵ تۆ بکەم. حەسەن وتی: لەسەر بنەمای نوسراوی خوا و شێوازی پێغەمبەر چونکە لەخۆگری هەمو شتێکن، بەیعەت وەردەگرم. خەڵك لەگەڵ ئەو بەیعەتیان کرد. حەسەن بەم شێوە پەیمانی لەوان وەردەگرت، ئێوە فەرمانبەری منن، لەگەڵ هەرکەس ئاشتی بکەم، ئاشتی بکەن و لەگەڵ هەرکەس شەڕم کرد، شەڕ بکەن. خەڵکان هەمان کات گومانیان بۆ دروست بو و وتیان: ئەمە ئەو ڕێبەرە نیە دەتانەویست، ئەو ئاهەنگی جەنگ و شەڕی هەیە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا موغەیرە کوڕی شەعبە لەگەڵ خەڵك حەجی کرد و نامەیەك لەلایەن معاویەوە گەیشت. دەڵێن: ئەو ڕۆژی (ترویە) (هەشتی زی حەججە) ئایینی عەرەفاتی ئەنجامدا و ڕۆژی عەرەفە مەڕی سەربڕی تا لەنهێنیەکەی ئاگادار نەبنەوە. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوە ئەم کارەی کرد چونکە هەواڵی پێگەیشت عوتبە کوڕی ئەبی سوفیان وەك سەرپەرەستی ئایینەکانی حەج لەبەرەبەیان هێرشی دەکاتە سەر.

هەروەها لەم ساڵەدا لەبەیت ئەلموقەدەس وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست، پێشتر لەشام بەفەرماندار بانگیان دەکرد بەڵام کاتێك عەلی کوژرا، ئەویان بەسەروەری باوەڕداران ناو برد. ئەمە گێڕانەوەی دەستەیەك لەمێژوونوسانە. پێشتر ئاماژەمان پێدا دوای داستانی (دو داوەرەکە) وەك خەلیفە بەیعەتیان پێدا. و خوا زاناترە.

لەم ساڵەدا و چل شەو دوای کوژرانی عەلی، ئەشعەس کوڕی قەیس مرد و حەسەن نوێژی لەسەر خوێند.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی سابت و ئەبو رافع کۆیلەی پێغەمبەر، مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا شورەحبیل کوڕی سێمتی کەندی لەهاورێکانی معاویە، مرد. دەستەیەك دەڵێن: چاوی بەپێغەمبەر کەوتوە و دەستەیەك دەڵێن نە.

لەسەرەتای خەلافەتی عەلی، جەهجەهای غەفاری لەهاوەڵانی پێغەمبەر مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حارس کوڕی خەزمەی ئەنساری، لەشەڕکەرانی بەدر و ئوحود، مرد.

لەم ساڵەدا خەوات کوڕی جوبەیری ئەنساری لەمەدینە مرد. ئەو لەگەڵ پێغەمبەر بۆ شەڕی بەدر ڕۆشت و لەبەر هۆکارێك گەڕایەوە و پێغەمبەر بەشی بۆ دانا. ئەو خواوەندی (ذات النحيين) بو.

لەخەلافەتی عەلی قەرەزە کوڕی کەعبی ئەنساری لەکوفەماڵئاوایی لەجیهان کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نیە بەڵکو ئەو لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی موغەیرە کوڕی شەعبە لەکوفە مرد. لەشەڕی ئوحود و هاوشێوەکانی شان بەشانی پێغەمبەر شەڕی کرد و لەشەڕەکانی عەلی بەشداری کرد.

مەعاز کوڕی عەفرای ئەنساری، لەسەرەتای خەلافەتی عەلی ماڵئاوایی لەجیهان کرد. ئەو لەهەمو شەڕەکانی پێغەمبەر بەشداری کرد.

هەروەها لەخەلافەتی عەلی لوبابە کوڕی عەبدولمونزەری ئەنساری مرد. ئەو پێگەی (گەورەی) هەبو و لەشەڕی بەدر هاورێیەتی پێغەمبەری کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نیە بەڵکو پێغەمبەر ئەوی کردە جێگری خۆی لەمەدینە و لەنیوەی ڕێگا ئەوی گەڕاندەوە و بەشی بۆ دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا موعەیقێب کوڕی ئەبی فاتمەی دەوسی لە(یاران) و لەیەکەم موسوڵمانەکان ماڵئاوایی لەجیهان کرد. ئەو هەڵگری مۆری پێغەمبەر بو. ئەو گرفتاری نەخۆشی خۆرە ببو. ئەبوبەکر و عومەر ئەویان کردە لێپرسراوی گەنجینە. ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر لەرۆژگاری عوسمان لای ئەو بو و لەدەستی ئەو کەوتە ناو چاڵەکە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەکۆتایی خەلافەتی عوسمان مرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی چل و یەکەمی کۆچی( ٦٦١ زایینی )

**سپاردنی خەلافەت بەمعاویە لەلایەن حەسەن کوڕی عەلی**

لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب چل هەزار کەس لەسوپاکەی لەسەر مەرگ پەیمانیان بەست و ئەمە لەکاتێکدا بو لەهێرش و پەلاماری بەردەوامی خەڵکانی شام ئاگاداریان کردەوە. عەلی لەو کاتەی خۆی بۆ شەڕێکی تازە لەگەڵ معاویە ئامادە دەکرد، کوژرا. کاتێك خوا بیەوێت کارێك ئەنجام بدات، کەس ناتوانێت ڕێگەی لێ بگرێت. کاتێك عەلی کوژرا و خەڵك لەگەڵ کوڕەکەی بەیعەتیان کرد، ئاگاداربویەوە کەمعاویە هاورێ لەگەڵ سوپای شام بۆ شەڕ ئامادە بوە. ئەو هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و هاورێ لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵ عەلی بۆ مەرگ پەیمانیان بەستبو، لەکوفەوە بەرێکەوت تا روبەروی معاویە ببێتەوە. معاویە لە(مەسکەن) دابەزیبو. حەسەن گەیشتە مەداین و قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادەی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی سوپاکەی خۆی کەژمارەیان دەگەیشتە دوانزە هەزار کەس. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو حەسەن عەبدالله کوڕی عەباسی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی و عەبدالله قەیس کوڕی سەعدی کردە فەرماندەی هێرشبەران. کاتێك حەسەن لەمەداین دابەزی، جارچیەك لەناو سوپا جاڕیدا: ئاگادار بن قەیس کوڕی سەعد کوژرا، بلاوەی لێ بکەن. خەڵك ڕەمیان کرد و هێرشیان کردە سەر خێوەتەکانی حەسەن و تالآنیان کرد تا ئەو جێگەی ڕاخەرەکەیان لەژێر پێیدا دەرهێنا. بێزاری حەسەن لەوان زیادی کرد و دڵی لەترس و دوژمنایەتی ئەوان خوێناوی. ئەو لەمەداینەوە ڕۆشتە (ئەیوانی سپی). فەرمانداری مەداین سەعد کوڕی مەسعودی سەقەفی مامی موختار کوڕی ئەبی عوبەیدە بو. موختار کەکوڕێکی گەنج بو، بەمامی خۆی وت، ئایا دەتەوێت دەوڵەمەند بیت و شەرەف و گەورەییت پێ ببرێت. پرسی: چۆن؟ وتی: دەست وپێی حەسەن دەبەستین و تەسلیمی معاویەی دەکەین. مامی پێی وت: خوا نەفرەتت کات! هێرش بکەمە سەر کوڕی کچی پێغەمبەر و دەست وپێی ببەستم و بەدوژمنی بسپێرم! چەندە پیاوێکی خراپیت!

کاتێك حەسەن بینی خەڵك لەدەوری ئەو بلاوەیان لێکردوە، نامەی بۆ معاویە نوسی و

چەندین مەرجی پێشنیار کرد و وتی: ئەگەر بەمەرجەکانی من رازی بیت، فەرمانبەر و گوێ رایەڵی تۆ دەبم و تۆ دەبێت بێ کەم و کوڕی داواکاریەکانی من بێنیتەدی. بەبراکەی حسین و عەبدالله کوڕی جەعفەری وت: من بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی، نامەم بۆ معاویە نوسیوە. حسەین وتی: سوێند دەدەم بەخوا ئاگادار بە ئەفسانەی معاویە نەهێنیتەدی و داستانی باوکت بەدرۆ بخەیتەوە! حەسەن وتی: بێدەنگ بە، من لەم کارە شارەزاترم.

کاتێك نامەی معاویە بەحەسەن گەیشت، هەڵیگرت. معاویە پێشتر عەبدالله کوڕی عامر و عەبدولرەحمان کوڕی سەمورە کوڕی حەبیب کوڕی عەبد شەمسی پێش گەیشتنی نامەکەی حەسەن بەنامەیەکی سپی کەبەشی خوارەوەی مۆر کردبو، رەوانەی حەسەن کردبو و وتبوی: لەم نامەدا کەمۆری منی پێوەیە، هەر مەرجێکت هەیە بینوسە.

کاتێك نامەی معاویە بەحەسەن گەیشت، چەندین بەرابەری ئەو مەرجانەی بۆ معاویەی نوسیبو، داوای کرد و نامەکەی معاویەی لای خۆی هێشتەوە. کاتێك حەسەن کاروباری بەمعاویە سپارد، داوای لێکرد ئەو مەرجانەی لەنامەکەیدا ئاماژەی پێدراوە، بێنیتەدی و بەوی ببەخشێت. معاویە خۆی بەدور گرت و وتی: ئەوەی داوات کردبو، بەتۆم بەخشی. کاتێك ئاشتیان کرد حەسەن لەناو خەڵکانی عێراق قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکی عێراق بۆ سێ کار لەئێوە خۆش دەبم: ئەوەی کەباوکی منتان کوشت، جەستەمتان خستە بەر لێدانەکانی خۆتان و کاڵاکانی منتان تاڵان کرد.

داواکاریەکانی حەسەن لەمعاویە ئەمە بو کە هەمو سامان و دارایی گەنجینەی کوفە کە(پێنج ملیۆن درەم)بو، بەو ببەخشێت هاورێ لەگەڵ باجی دارابگەرد و جوێن بەعەلی نەدرێت. حەسەن داوای لێکرد بەئامادەبونی ئەو جوێن بەباوکی نەدرێت. معاویە بەمە رازی بو بەڵام دواتر پەیمانەکەی خۆی نەبردە سەر. خەڵکی بەسرە نەیانهێشت باجی دارابگەرد بەو بگات و وتیان: ئەمە بەشی ئێمەیە، ناهێڵین بەکەسی دیکە بگات. ئەم کارەیش بەفەرمانی معاویە بو.

معاویە پێنج رۆژ بۆ کۆتایی رەبیع الاولی ئەم ساڵە٢٩/ ژوئیەی ٦٦١زایینی خەلافەتی لەحەسەن وەرگرتەوە. دەستەیەك دەڵێن: حەسەن لەبەر ئەوە خەلافەتی بەمعاویە

سپارد چونکە معاویە سەبارەت بەم کارە نامەی بۆ نوسی. حەسەن لەناو خەڵکدا وتارێکیدا، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: سوێند بەخوا نەگومان لەشەڕ لەگەڵ خەڵکانی شام دورمان دەخاتەوە، نە پەشیمانی. ئێمە لەسەر بنەمای راستی و خۆڕاگری شەڕمان لەگەڵ ئەوان کرد. ئێستا راستی بۆ دوژمنایەتی و خۆڕاگری بۆ بێ ئۆقرەیی گۆڕاوە. ئێوە لەکاتی رەوانە بون بەرەو شامیەکان بەشێوەیەك بون کەپابەندبونتان بەدین لەپێش شەیدا بون بەم جیهانەوە بو. ئەمرۆ بەشێوەیەکن، شەیدابون بۆ ئەم جیهانە، پابەندبون بەدینی لەئێوە سەندۆتەوە. ئێوە لەناو دودەستەی کوژراودا جێگیرن: ئەو کوژراوانەی لەصەفین کەبۆ ئەوان دەگرین و ئەو کوژراوانەی لەنەهرەوان کەداوای خوێنی ئەوان دەکەن. ئەوەی ماوەتەوە، هاوکاری ناکات و ئەوەی دەگریت، پەرێشانە. معاویە داوای کارێکی لەئێمە کردوە، نەدادپەروەریە نەرێزداری. ئەگەر خوازیاری مەرگن، بەداواکەی رازی نابین و ئەگەر خوازیاری ژیانن بەداواکەی رازی دەبین و ئێوەیش بەرەزامەندی دەگەن.

خەڵك لەهەر لایەکەوە هاواریان کرد: ژیان، ژیان! ئەو ئاشتی کرد.

کاتێك مەبەستی ئەوەی کرد خەلافەت بەمعاویە بسپێرێت، وتارێکی بۆ خەڵکدا و وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە سەروەر و میوانی ئێوەین بنەماڵەی پێغەمبەرەکەتان کەخوا ناپاکی لەوان سڕیوەتەوە و راست و خاوێنی کردون. ئەم قسانەی بەشێوەیەك کرد هەمو ئامادەبوان دەستیان بەگریان کرد بەشێوەیەك دەنگی گریانی ئەوان بۆ ئاسمان بەرز بویەوە. کاتێك بەمەبەستی ئاشتی بەرەو لای معاویە بەرێکەوتن، لەسەر بنەمای ئەوەی ئاماژەمان پێدا، ئاشتیان کرد و حەسەن خەلافەتی بەو سپارد.

ماوەی خەلافەتی حەسەن پێنج مانگ و نیوی خایاند و ئەمە لەسەر بنەمای گێڕانەوەی کەسێکە دەڵێت: ئەو لەمانگی رەبیع الاول دەستی لەکار کێشایەوە، شەش مانگ و چەند رۆژێك خەلافەتی کرد لەسەر بنەمای گێڕانەوەی کەسێك کەدەڵێت: لە رەبیع الثانی دەستی لەکار کێشایەوە. وحەوت مانگ وچەند رۆژێك لەسەر بنەمای گێڕانەوەی کەسێك کەدەڵێت: لەجەمادی الاول خەلافەتی بەمعاویە سپارد.

کاتێك ئاشتیان کرد و حەسەن لەگەڵ معاویە بەیعەتی کرد، معاویە رۆشتە کوفە و خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ کرد. حەسەن نامەی بۆ سەعد کوڕی قەیس نوسی

کەفەرماندەی دوانزەهەزار لەپێشەنگەکانی سوپاکەی بو و فەرمانی پێدا فەرمان لەمعاویە وەربگرێت. قەیس لەناو خەڵك هەستا و وتی: یا بەفەرمانی رێبەرێکی گومرا رازی ببن، یا بێ رێبەر شەڕ بکەن. دەستەیەك وتیان: بەرێبەرایەتی رێبەرێکی گومڕا رازی دەبین. ئەوانیش لەگەڵ معاویە بەیعەتیان کرد. بەهەمان شێوە کەدواتر ئاماژەی پێدەدەین، قەیس لەگەڵ شوێنکەوتوانی خۆی گەڕایەوە.

کاتێك معاویە ڕۆشتە ناو کوفە، عەمرۆعاص بەمعاویەی وت بەحەسەن فەرمان بدات تا زمان گیرانی بۆ خەڵك ئاشکرا ببێت. معاویە قسەی بۆ خەڵك کرد و دواتر فەرمانی بەحەسەندا قسە بۆخەڵك بکات. حەسەن بێ ئامادەیی پێشوەخت هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، خواوەند بەیەکەم کەس لەبنەماڵەی ئێمە ئێوەی بۆ رێگەی راست رێنوێنی کرد و بەدوایین کەس لەئێمە رێزی لەخوێنی گرت. ئەم کارە ماوەکەی کورتە و ئەم جیهانە لەدەستی کەسەکاندا دەسوڕێت. خوای گەورە و رێزدار لەزمانی پێغەمبەرەکەی وتویەتی: چوزانم ئەگەری هەیە تاقی کردنەوەیەك بێت لەسەر ئێوە و کالآیەك بۆ رۆژگارێك (ئەنبیا /١١١/٢١) کاتێك حەسەن ئەمەی وت، معاویە پێی وت: دانیشە. لەبەر ئەم کارە رقی عەمرۆعاصی لەدڵ گرت و وتی: ئەمە لەدواهاتەکانی راوێژکردنی شوومی تۆبو.

حەسەن لەگەڵ کەسان و بنەماڵەکەی خۆی بەرەو مەدینە بەرێکەوتە و خەڵك لەکاتی کۆچ کردنی ئەوان لەکوفە، دەستیان بەگریان کرد.

بەحەسەنیان وت: چ شتێك بۆ ئەم کارە هانیدایت؟ وتی: لەم جیهانە بێزار بوم و خەڵکانی کوفەم وەك کەسانێك هاتە بەرچاو کە کەس ناتوانێت پشتیان پێ ببەستێت مەگەر ئەوەی شکەست بخوات. هیچ کام لەوان لەمەبەست و ئارەزووەکانیان لەگەڵ ئەویتریان کۆك نیە. لەگەڵ یەك ناسازگارن و باوەڕیان بەچاکە و خراپە نیە. باوکم لەوان ڕەنجی فراوانی برد. خۆزگە دەمزانی دوای من شیاو دەبن بۆ چ کەسێك. ئەم سەرزەمینە زوتر لەهەمو شارەکانی دیکە وێران دەبێت.

کاتێك حەسەن لەکوفەوە بەرێکەوت، لەرێگادا پیاوێکی بینی، پیاوەکە پێی وت: ئەی ڕوڕەش کەری موسوڵمانان! حەسەن وتی: سەرکۆنەی مەکە چونکە پێغەمبەر لەخەودا بینی ئومەوییەکان یەك لەدوای یەك دەچنە سەرتەخت. لەم خەوەی خەمبار بو، خوا

ئەم ئایەی نارد: ئێمە زیاترینمان بەتۆ بەخشی (کوثر / ١/١٠٨) مەبەستی لە(زیاترین) روبارێکە لەبەهەشت. دوبارە ئەم ئایەی نارد: ئێمە ئەم نوسراوەمان لەشەوی ئەندازەگراندا رەوانە کرد. تۆ چوزانیت شەوی ئەندازە گران چیە. شەوێکە باشتر لەهەزار مانگ. فریشتەکان هاورێ لەگەڵ (ناخ) لەم شەوەدا بەفەرمانی خواوەندەکەیان لەگەڵ هەمو فەرمانەکان دادەبەزن. سلاّو لەناویدا تا کاتی بەرەبەیان (قدر / ٩٧/ ١—٥). مەبەستی ئەوە بو نومەوییەکان دوای پێغەمبەر کاروبارەکان دەگرنەدەست (کەرۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەوان هەزار مانگە.)

## ئاشتی معاویە لەگەڵ قەیس کوڕی سەعد

لەم ساڵەدا لەنێوان معاویە و قەیس کوڕی سەعد ئاشتی سەقامگیر کرا چونکە قەیس بەیعەتی لەگەڵ معاویە نەکردبو. هۆکاری بەیعەت نەکردنەکەی لەبەر ئەوە بو کاتێك عەبداللە کوڕی عەباس ئاگادار بویەوە حەسەن دەیەوێت خەلافەت بەمعاویە بسپێرێت، نامەی بۆ معاویە نوسی و داوای ئەمانی کرد بەو مەرجەی هەر ئەندازە سامانێك بەدەستی هێناوە و هەرچی لەدەستدایە، بۆ خۆی بێت و معاویە لێی وەرنەگرێت. معاویە بەداواکاریەکانی رازی بو. ئەو عەبداللە کوڕی عامری بەسوپایەکی گەورە بۆ شەڕی عوبەیداللە رەوانە کرد. عوبەیداللە شەوانە بەرەو لای ئەوان ڕۆیشت و سوپاکەی ژێر دەستی خۆی بێ فەرماندە بەجێهێشت. قەیس کوڕی سەعد لەناو ئەواندا بو. ئەوان قەیسیان وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد و پەیمانیان بەست شەڕ لەگەڵ معاویە بکەن تا ئەو کاتەی بەڵێنەکانی خۆی بێنێتەدی تا هاوەڵانی عەلی ئازار نەدات و خوێن و سامانی ئەوان بپارێزێت. دەستەیەك دەڵێن: قەیس خۆی فەرماندەی ئەو سوپایە و سەرکردەی پێشەنگەکان بو. پێشتر ئاماژەمان بەمەدا. قەیس لەفەمانڕەوایی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بێزار بو. کاتێك هەواڵی پێگەیشت کەحەسەن کوڕی عەلی لەگەڵ معاویە ئاشتی کردوە، دەستەیەکی فراوان دەوریان گرت و لەسەر بنەمایی شەڕ کردن لەگەڵ معاویە پەیمانیان بەست تا شوێنکەوتوانی عەلی بۆ خوێن و سامانەکانیان و ئەو تالآنیانەی لەشەڕەکاندا دەستیان کەوتوە، ئەمان ببەخشرێن. معاویە نامەی بۆ نوسی و داوای فەرمانبردنی لێکردن و نامەیەکی بۆ

ڕەوانە کرد و خوارەوەی نامەکەی واژۆ کردبو. پێی وت: هەرچیت دەوێت، لەنامەکەدا بینوسە و من بەتۆی دەبەخشم. عەمرۆعاص پێی وت: ئەمەی پێ مەدە و شەڕی لەگەڵدا بکە. معاویە وتی: بێدەنگ بە و بمرە! ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵ نابین تا ئەو کاتەی بەئەندازەی خۆیان لەخەڵکانی شام دەکوژن، دوای ئەوە چ سودێك لەژیان؟ سوێند بەخوا هیچ کات شەڕی لەگەڵ ناکەم مەگەر ئەوەی بەم کارە ناچار ببم.

کاتێك معاویە ئەو نامەی بۆ قەیس نارد، قەیس بۆ خۆی و شوێنکەوتوانی عەلی داوای ئەمانی کرد، یانی ئەگەر ئەوان خوێنێکیان ڕشتوە یاسامانێکیان دەستکەوتوە، لەزیان بەدور بن. لەو نامەدا داوای سامانی نەکرد و معاویە داواکاریەکانی هێنایەدی و قەیس کوڕی سەعد ملکەچی فەرمانەکانی بو.

لەو رۆژگارە، لەکاتی دروست بونی ئاژاوەکان، خەڵکی بیرتیژ و وشیار و ئاگای عەرەبیان لەپێنج کەس دادەنا و دەیانوت ئەوانە بیرمەندان و فێڵبازانی عەرەبن: معاویە کوڕی ئەبی سوفیان، عەمرۆعاص، موغەیرە کوڕی شەعبە، قەیس کوڕی سەعد و عەبداللە کوڕی بودەیلی خوزاعی. قەیس و کوڕی بودەیل هاوڕێی عەلی بون و موغەیرە لەتایف گۆشەگیری هەڵبژاردبو. کاتێك کاروبارەکان بۆ معاویە ئارامی گرت، سەعد کوڕی وەقاص ڕۆشتە لای و پێی وت: ئەی پاشا، سڵاو لەتۆ! معاویە پێکەنی و وتی: ئەی باوکی ئیسحاق، بۆ نەتوت: ئەی سەروەری باوەڕداران؟ سەعد وتی: ئەم قسەیە بەمشێوەیە بەشادی و پێکەنین دێنیتە سەر زمان؟ سوێند بەخوا ئارەزوم نەدەکرد فەرمانڕەوایی سەرزەوی بەشێوەی تۆ بەدەست بێنم!

## شۆڕشی خەواریج لەبەرابەر معاویە

پێشتر ئاماژەمان پێدا فەروە کوڕی نەوفلی ئەشجەعی لەگەڵ پێنسەد کەس لەخەواریج ڕۆشتنە شارەزور و شەڕ کردن لەگەڵ عەلی و حەسەنیان پشتگوێ خست. کاتێك حەسەن کارەکانی بەمعاویە سپارد، وتیان: ئێستا پەردە تاریکی و گومان لادرا و راستی و دروستی ئاشکرابو. ڕوبەڕوی معاویە ببنەوە و شەڕ دژی ئەو دەست پێبکەن. ئەوان بەسەرکردایەتی فەروە کوڕی نەوفل هاتن و لەنوخەیلە لەنزیك کوفە خێوەتیان هەڵدا. حەسەن کوڕی عەلی بەمەبەستی مەدینە بەرێکەوتبو. معاویە نامەی بۆ نوسی

و فەرمانی پێدا لەگەڵ خەواریج شەڕ بکات. نێردراوەکەی لەقادسیە یا دەوروبەری گەیشتە حەسەن، بەڵام حەسەن نەگەڕایەوە و بۆ معاویەی نوسی: ئەگەر دەمویست لەگەڵ موسوڵمانان شەڕ بکەم لەتۆوە دەستم پێدەکرد. من بۆ باش بونی بارودۆخی خەڵك و پاراستنی خوێنی ئەوان لەشەڕکردن لەگەڵ تۆ چاوم پۆشی.

معاویە سوپایەکی لەخەڵکانی شام رەوانە کرد تا شەڕ لەگەڵ خەواریج بکەن. ئەوان شەڕیان کرد و خەڵکانی شام شکەستیان خوارد. معاویە بەخەڵکانی کوفەی وت: سوێند بەخوا لای من ئەمانتان نیە مەگەر ئەوەی زیانی ئەوان دور بکەنەوە. خەڵکانی کوفە هاتن و شەڕیان لەگەڵ خەواریج کرد. خەواریج وتیان: ئایا معاویە دوژمنی ئێمە و ئێوە نیە؟ رێگەمان بدەن شەڕی لەگەڵدا بکەین. ئەگەر سەرکەوتین، دوژمنی ئێوەمان لەناو بردوە، و ئەگەر شکەستمان خوارد قورسایی شەڕ دژی ئێمە لەسەر شانی ئێوە هەڵدەگیرێت. خەڵکانی کوفە وتیان: بەناچاری دەبێت شەڕ لەگەڵ ئێوە بکەین. خەڵکانی ئەشجەع دەوری هاورێکەی خۆیان(فەروە)یان گرت و گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و ئامۆژگاریان کرد بەڵام ئەو لەبریارەکەی پاشگەز نەبویەوە. ئەویان بەزۆر گرت و بۆ کوفەیان برد. خەواریج پیاوێکیان لەتەی بەناوی عەبداللە کوڕی حەوسا کردە فەرماندەی خۆیان. خەڵکانی کوفە شەڕیان دەست پێکرد و خەواریجیان لەمانگی رەبیع الاول یا رەبیع الثانی / ژوئیە یا ئوتی ٦٦١ زایینی کوشتار کرد و کوڕی ئەبی حەوسا کوژرا. کاتێك کوڕی ئەبی حەوسا بوبەفەرماندەی ئەوان، لەترسی ئەوەی پاشا لەداری بدات، ترسا و وتی:

| | |
|---|---|
| ما ان ابالی اذا ارواحنا قبضت | ماذا فعلتم باوصال و ابشار |
| تجری المجرة و النسران عن قدر | و الشمس و القمر الساری بمقدار |
| و قد علمت و خیر القول انفعة | ان السعید الذی ینجو من النار |

یانی: کاتێك گیانمان لێ بستێنن ترسم نیە لەگەڵ دەمار و ئێسقانەکان و گۆشتەکەم چی دەکەن. کاکێشان و دو ئەستێرەکە لەسەر بنەمای چارەنوس دەسورێنەوە و خۆر و مانگ لەسورانەوەی خۆیان ئەندازەیەکیان هەیە. بەباشی زانیم ( و باشترین وتە سوندمەندترینیانە) کەبەختەوەر ئەو کەسەیە لەئاگری دۆزەخ رزگاری بێت.

## شۆڕشی حەوەسەرە کوڕی وەداع

کاتێك کوڕی ئەبی حەوسا کوژرا، خەواریج کۆبونەوە و حەوەسەرە کوڕی وەداع کوڕی مەسعودی ئەسەدیان کردە سەرکردەی خۆیان. ئەو لەناو ئەوان وتارێکی پێشکەش کرد و سەرکۆنەی فەروە کوڕی نەوفلی کرد لەبەر ئەوەی بۆ شەڕ دژی عەلی گومانی هەبو. ئەو خەواریجی کۆکردەوە و لەبەراز ئەلروز (ئەو شوێنەی ژیانی لێ بەسەر دەبرد) هاورێ لەگەڵ سەد و پەنجا کەس بەرێکەوت تا لەنوخەیلە دابەزی. پاشماوەکانی دارودەستەکەی کوڕی ئەبی حەوسا کەژمارەیەکی کەم بون، پەیوەستی بون. معاویە باوکی حەوەسەرەی بانگ کرد و پێی وت: برۆ بۆ لای کوڕەکەت لەوانەیە ئەگەر تۆ ببینێت، دڵی نەرم بێت. ئەو ڕۆشتە لای کوڕەکەی و گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، سوێندیدا و وتی: ئایا دەتەوێت کوڕەکەت بۆ بێنم ، لەوانەیە ئەو کاتەی دەیبینیت، بەڕەوای نەزانی لێی دور بیت؟ حەوەسەرە وتی: ئەگەر لەدەست خوا نەشناسێك ڕمم بەرکەوێت ولەناو خوێنی خۆمدا پەلەقاژە بکەم، باشترە لەوەی کوڕەکەم ببینم. باوکی ڕۆشت و معاویەی لەوتەکانی ئاگادار کردەوە. معاویە دو هەزار پیاوی شەڕکەری بەفەرماندەیی عەوف کوڕی ئەحمەر ڕەوانە کردباوکی حەوەسەرە لەگەڵیاندا ڕۆشت. ئەو داوای روبەروبونەوەی لەکوڕەکەی کرد. کوڕ وتی: ئەی باوکە دەتوانی لەگەڵ کەسانی دیکە شەڕ بکەیت، واز لەمن بێنە. کوڕی عەوف لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و خەواریج خۆڕاگریان کرد. حەوسەرە لەگەڵ عەبداللە کوڕی عەوف دەرگیر بو. کوڕی عەوف ئەوی کوشت و هاوەڵانی کوشتار کرد جگە لەو پەنجا کەس کە بۆ کوفە ڕۆشتن. ئەم شەڕە لەجەمادی الاولی ساڵی چل و یەك / سێپتامبەری ٦٦١ زایینی رویدا. کوڕی عەوف کاتێك ناوچاوی حەوەسەرەی بینی، زانی نوێژی زۆر خوێندوە و لەکوشتنی ئەو پەشیمان بویەوەو و وتی:

| | |
|---|---|
| قتلت اخا بنی اسد سفاها | لعمر ابی فما لقیت رشدی |
| قتلت مصلیا محیاء لیل | طویل الحزن ذابر و قصد |
| قتلت اخا تقی لانال دنیا | و ذاك لسقوتی و عثار جدی |
| فهب لی توبة یا رب و اغفر | لما قارفت من خطا و عمد |

یانی: زادەی بەنی ئەسەدم بەنەزانی کوشت و بەگیانی خۆم بەرێگەی راست نەگەیشتم. من پیاوێکی شەو زیندو و نوێژکەرم کوشت کەخەمی زۆری لەناو دڵەکان بەجێهێشت و چاکەکار بو و ئاهەنگی چاکیەکانی دەکرد. پیاوێکی خۆپارێزم کوشت تا بەمەبەستەکانی ئەم دنیا بگەم و ئەمە لەبەختی رەشی من و هەڵەی بەختم بو. خواوەندا بەتۆبەکەی من رازی بە و لەمن خۆشبە چونکە بەمەبەستەوە گوناح و تاوانم ئەنجامدا.

## شۆڕشی فەروە کوڕی نەوفل و کوژرانی ئەو

بەدوای بەرێکەوتنی معاویە، فەروە کوڕی نەوفلی ئەشجەعی رووبەروی موغەیرە کوڕی شەعبە بویەوە. موغەیرە چەندین سواری بەسەرکردایەتی شەبەس کوڕی رێبعی یا مەعقەل کوڕی قەیس بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد. ئەوی لەشارەزور گرت و کوشتی. دەستەیەك دەڵێن: لەشوێنێك لەسواد کوژرا.

## بەسەرهاتی شەبیب کوڕی بەجرە

شەبیب لەکاتی کوژرانی عەلی لەگەڵ کوڕی مولجەمدا بو. کاتێك معاویە هاتە ناو کوفە، کوڕی بەجرە بۆ نزیك کەوتنەوە لەو لێی نزیك کەوتەوە و وتی: من و کوڕی مولجەم عەلیمان کوشت. معاویە ترساو لەناو کۆڕەکەدا هەستا و ڕۆشتە ماڵەکەی خۆی و پەیامی بۆ خەڵکی ئەشجەع نارد و وتی: ئەگەر شەبیب ببینم یا ببیستم لەبەر دەرگای ماڵەکەی منە، هەموتان لەناو دەبەم. ئەو لەم شارە دور بکەنەوە. لەمەدوا شەبیب شەوانە بەتاریکی دەهاتەدەر و هەر کەسێکی دەبینی، دەیکوشت. کاتێك موغەیرە کوڕی شەعبە بوبەفەرمانداری کوفە، شەبیب لەقف ڕۆشتە لای ئەو. (قف) شوێنێکە لەنزیکی کوفە. موغەیرە چەندین سواری بەسەرکردایەتی خالید کوڕی عورفەتە یا مەعقەل کوڕی قەیس بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد. شەڕ دەستی پێکرد و شەبیب و هاورێکانی کوژران.

## بەسەرهاتی موعینی خارجی

موغەیرە کوڕی شەعبەیان ئاگادار کردەوە کەموعین کوڕی عەبداللە، پیاوێك لەهۆزی بەنی مەحارب، ئاهەنگی شۆڕشی لەسەردایە. ناوی ئەو (مەعن) بو کەکورتیان کردەوە و بەموعین ناویان دەبرد. موغەیرە کەسی بۆ لای ئەو و هاوڕێکانی ڕەوانە کرد و گرتیان و خستیانە زیندانەوە. موغەیرە نامەی بۆ معاویە نوسی و ئەوەی لەبەسەرهاتەکەی موعین ئاگادار کردەوە. معاویە وتی: ئەگەر شایەتی بدات کەمن(جێگری پێغەمبەرم) ئازادی بکە. موغەیرە بانگی کرد و لێی پرسی: ئایا شایەتی دەدەیت معاویە جێگری پێغەمبەر و سەروەری باوەڕدارانە؟ موعین وتی: شایەتی دەدەم کەخوای گەورە راست و دروستە، بێ گومان ڕۆژی کۆتایی دێت و خوا مردوەکان لەناو گۆڕەکان زیندو دەکاتەوە. موغەیرە فەرمانیدا و کوشتیان. قەبیصەی هیلالی ئەوی کوشت. کاتێك رۆژگاری بیشر کوڕی مەروان گەیشت، پیاوێك لەخەواریج لەبەردەرگای ماڵی قەبیصە دانیشت تا هاتەدەر و دواتر کوشتی. کەس نەیزانی بکوژەکەی قەبیصە کێیە تا ئەو کاتەی لەگەڵ شەبیب کوڕی یەزید شۆڕشی کرد و کاتێك گەیشتە کوفە، وتی: ئەی دوژمنانی خوا، من بکوژی قەبیصەم!

## شۆڕشی باوکی مریەم

دواتر باوکی مریەم، خزمی بەنی حارس کوڕی کەعب، هاوڕێ لەگەڵ دوژن شۆڕشی کرد: قەتام و کوحەیلە. ئەو یەکەم پیاو بو ژنانی بۆ شۆڕش هاندا. باوکی بیلال کوڕی ئودیە ئەم کارەی ئەوی بەناڕەوا زانی. باوکی مریم وتی: ژنان هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا و شان بەشانی موسوڵمانان لەشام شەڕیان کرد. من ئەم دوانە دەگەڕێنمەوە. دواتر ئەو ژنانەی گەڕاندەوە. موغەیرە جابری بەجەلی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد و باوکی مریەم و هاوڕێکانی لەبادوریا کوژران.

## شۆڕشی باوکی لەیلا

باوکی لەیلا پیاوێکی ڕەش و درێژ بو. بەهەردو دەست دەرگای مزگەوتی کوفەی گرت و لەم کاتەدا دەستەیەك لەگەورەکان لەناو مزگەوت دانیشتبون. ئەو بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ((فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا)) (ئەمە دروشمی خەواریج بو). کەس گرنگی پێنەدا. شۆڕشی دەست پێکرد و هاورێ لەگەڵ ئەو سی پیاو لەخزمانی هۆزەکان هاتنەدەر. موغەیرە مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد و ئەوی لەساڵی ٤٢/ ٦٦٢ زایینی لەسواد کوشت.

## دەست نیشان کردنی موغەیرە کوڕی شەعبە وەك فەرمانداری کوفە

لەم ساڵەدا معاویە عەبدالله کوڕی عەمرۆعاصی وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان کرد. موغەیرە کوڕی شەعبە هاتە لای و پێی وت: عەبداللەت وەك فەرمانڕەوایی کوفە دەستنیشان کرد و فەرمانڕەوایی میسرت بەخشی بەباوکی، تۆ فەرمانڕەوایەك لەناو ددانەکانی دو شێردایت. معاویە ئەوی لەسەر کار لابرد و موغەیرەی لەشوێنەکەی ئەو دانا. عەمرۆعاصیان لەم وتەی موغەیرە ئاگادار کردەوە. عەمرۆعاص ڕۆشتە لای معاویە و وتی: موغەیرەت بۆ کۆکردنەوەی باج دەست نیشان کرد، ئەو سامان کۆدەکاتەوە و ناتوانیت یەك درەمی لێ بستێنیت. پیاوێك بۆ ئەم کارە دابنێ، لەتۆ بترسێت و خۆپارێزبێت. معاویە موغەیرەی لەم کارە دورخستەوە و تەنیا پێشنوێژی کردنی بەو سپارد.

کاتێك موغەیرە لەکوفە هاتە سەرکار، کەسیر کوڕی شەهابی وەك فەرمانڕەوایی رەی دەست نیشان کرد. ئەو لەسەر تەختی وتاردانی شاری رەی بەردەوام ئیهانەی عەلی دەکرد. کەسیر کوڕی شەهاب لەپۆستەکەی مایەوە تا ئەو کاتەی زیاد کوڕی ئوبیە بو بەفەرمانداری کوفە. زیاد بەهێزی کرد. ئەو لەگەڵ دەیلەمیەکان شەڕی کرد و عەبدالله کوڕی حەجاجی تەغلەبی ئەوی هاورێیەتی دەکرد. پیاوێکی دەیلەمی کوشت و هەمو کەل و پەل و کەرەستەکانی ئەوی هەڵگرت. کەسیر ئەو شتانەی لێ سەندەوە. ئەو پیاوە سوێندی دا تا بۆی بگەڕێنێتەوە بەڵام کەسیر ئەو کارەی نەکرد. پیاو

بەنهێنی لەسەر رێگاکەی دانیشت و بەشمشێر یا داردەست لەناوچاوی دا و شکاندی. دواتر وتی:

| | |
|---|---|
| من مبلغ افناء خندف اننی | ادرکت طائلتی من ابن شهاب |
| ادرکته لیلا بعقوة داره | فضربته قد ما علی الانیاب |
| هلا خشیت و انت عاد ظالم | بقصور ابهر اسرتی و عقابی |

یانی: کێیە لەمنەوە پەیامێك بۆ گەورەکانی خیندێف ببات و بڵێت کەمن قەرزەکەی خۆم لەکوڕی شەهاب وەرگرتەوە. شەوانە ئەوم لەبەردەرگای ماڵەکەی گرت و دەم و دان و روخساریم شکاند. تۆ کەپیاوێکی ستەمکاریت، بۆ لەناو کۆشکەکانی ئەبهەر لەکەسانی من و لەسزای من نەترسایت.

## فەرمانداری بوسر لەبەسرە

لەم ساڵەدا بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا بوبەفەرمانداری بەسرە.

- هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك حەسەن لەسەرەتاکانی ساڵی چل ویەك /٦٦١ زایینی لەگەڵ معاویە ئاشتی کرد و حومران کوڕی ئەبان وەك فەرمانداری بەسرە مایەوە و بەسەریدا زاڵبو، معاویە کوڕی ئەبی ئەرتای بەرەو لای ئەو رەوانە کرد و فەرمانی پێدا زیاد کوڕی ئوبیە بکوژێت. زیاد فەرمانداری فارس بو. عەلی کوڕی ئەبی تالب بۆ ئەو ناوچەیە، رەوانەی کرد. کاتێك بوسر گەیشتە بەسرە، وتارێکی پێشکەش کرد. لەوتارەکەیدا جوێنی بەعەلیدا و وتی: هەرپیاوێك کەگومان دەکات من راستگۆ یا درۆزنم، سوێندی دەدەم بەخوا راستی و درۆکانی من ئاشکرا بکات. ئەبو بەکرە وتی: سوێند بەخوا، تەنیا بەدرۆزنت دەزانین. دەڵێت: بوسر فەرمانیدا بیخنکێنن. ئەبولۆلۆی زەببی هەستا و بەهانایەوە و چو و زیانی لێ دورخستەوە. ئەبو بەکرە سەد جەریب زەوی پێبەخشی. بەئەبوبەکرەیان وت: بۆ ئەو کارەت کرد؟ وتی: ئێمەی بەخوا سوێنددا و ئەوسا راستیەکانی پێ نەڵێین؟

لەم کاتەدا معاویە نامەیەکی بۆ زیاد کوڕی ئوبیە نوسی و وتی: لای تۆ ئەندازەیەك لەسامانی خوا کۆبۆتەوە، ئەوەی لەدەستی تۆدایە، رەوانەی بکە. زیاد وەڵامی دایەوە: لای من هیچ نەماوەتەوە و هەرچیم هەبو، لەرێگای خوادا خەرج کرد و پاشماوەکەیم

لەشوێنێکدا داناوە تا ئەگەر پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو روبدات، بتوانم کەڵکی لێوەربگرم، ئەوەی زیادی بو، بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب رەوانە کرد. معاویە وتی: بۆ لای ئێمە وەرە تا لەکاروبارەکانت بکۆڵینەوە و ئەگەر لەنێوان ئێمەدا پەیمانێکی بەهێز بێت لەسەر ئەو بنەمایە هەڵس و کەوت دەکەین و گەرنە تۆ بۆ پەناگە و شوێنی خۆت دەڕۆیتەوە. زیاد بەم داوایە رازی نەبو. بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا منداڵە گەورەکانی زیادی بازداشت کرد و لەناو ئەوان: عەبدولرەحمان کوڕی زیاد، عوبەیدالله کوڕی زیاد (بکوژەکەی حسەین کوڕی عەلی) و عەباد کوڕی زیاد. ئەو بۆ زیادی نوسی: یا بێ چەند و چون دەڕۆیتە لای سەروەری باوەڕداران، یا کوڕەکانت دەکوژم. زیاد وەڵامی دایەوە، لەشوێنەکەی خۆم ناجوڵێم، تا خوا لەنێوان من و سەروەری تۆ داوەری بکات. ئەگەر کوڕەکانم بکوژیت، گەڕانەوەی هەموان بۆ لای خوایە و لەبەردەممان رۆژی هەستانەوە. بوسر بڕیاریدا ئەوان بکوژێت. ئەبوبەکرە ڕۆشتە لای و پێی وت: کوڕەکانی براکەمت بێ گوناح گرتوە، حەسەن لەگەڵ معاویە ئاشتی کردوە. لەسەر ئەو بنەمایەی هاوەڵانی عەلی لەهەر شوێنێك هەرچیان کردوە و بردوە، لەزیان بەدور بن، تۆ ئەدەتوانی زیان بە باوکیان بگەیێنیت نە بەخۆیان. ئەبوبەکرە داوای چەند رۆژ مۆڵەتی کرد تا بڕوات و نامەی معاویە بێنێت. ئەبوبەکرە بەرەو لای معاویە لەکوفە غاریدا و کاتێك ڕۆشتە لای ئەو وتی: ئەی معاویە، خەڵك پەیمانی خۆیان لەسەر بنەمای کوشتنی منداڵەکان بەتۆ نەداوە! معاویە پرسی: ئەی ئەبو بەکرە، مەبەستت چیە؟ وتی: بوسر دەیەوێت کوڕەکانی براکەم زیاد سەر ببڕێت. معاویە نامەی نوسی و فەرمانیدا ئەوان ئازاد بکەن. ئەبوبەکرە لەرۆژی دیاریکراو گەیشتە بەسرە و بینی بوسر کوڕەکانی زیادی لەکاتی هەڵاتنی خۆر هێناوەتەدەر تا سەریان ببڕێت. خەڵك کۆببونەوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەبوبەکرەیان دەکرد و لەناکاو بینیان سوار لەسەر ئەسپێکی تاتاری لەدوردەستەکانەوە دەرکەوتوە و بەردەوام ئازاری چوارپێکەی خۆی دەدات تا زووتر خۆی بگەیێنێت. ئەبوبەکرە لەچوارپێکەی دابەزی و وتی: خەوا گەورەیە و خەڵکیش ئەم وتەیان هێنایە سەرزمان. ئەو بەردەوان غاری دەکرد وپێش کوژرانی ئەوان کوڕی ئەبی ئەرتا بینی و نامەکەی معاویەی پێدا وئەوانی ئازاد کرد.

معاویە دوای کوژرانی عەلی نامەی بۆ زیاد نوسی و ئەوی ترساندبو. زیاد لەناو خەڵك

وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: سەرم سوڕماوە لەکوڕی ژنی جەرگ خۆر و پەنادەری دوڕوەکان وسەرکردەی سەگەکان کەنامەی نوسیوە و دەمترسێنێت هەرچەندە لەنێوان من وئەو دو کوڕە مامەکەی پێغەمبەری خوا ( کوڕی عەباس و حەسەن کوڕی عەلی) حەفتا هەزار پیاوی شەڕکەری شمشێر بەدەستن! سوێند بەخوا ئەگەر بتوانێت خۆی بەمن بگەیێنێت، من وەك بەهێزترین شمشێر بەدەستەکان دەبینێت. کاتێك حەسەن لەگەڵ معاویە ئاشتی کرد و معاویە ڕۆشتە کوفە، زیاد لەقەلأیەك (قەلأی زیاد) پەنای گرت.

ئەوەی گومان دەکات لەم نامەیەدا، مەبەستی زیاد عەبداللە کوڕی عەباسە، گومانێکی هەڵە لەسەردا پەروەردە دەکات چونکە کوڕی عەباس لەژیانی عەلی لێی جیابویەوە.

دەستەیەك دەڵێن: معاویە ئەم نامەی کاتێك بۆ زیاد نوسی، هێشتا عەلی کوڕی ئەبی تالب زیندوبو و زیاد ئەم وتارەی لەوکاتەدا پێشکەش کرد و لەوتەکەی خۆی عەلی وەك کوڕە مامی پێغەمبەر ناوبرد. زیاد نامەی بۆ عەلی نوسی و لەم کارەی معاویە ئاگاداری کردەوە و عەلی وەلأمێکی دورودرێژی دایەوە. لەکاتی پەیوەست بونی زیاد بەمعاویە ئاماژەی پێ دەدەین.

## فەرمانداری کوڕی عامر لەبەسرە بۆ معاویە

معاویە بڕیاریدا عەتەبە کوڕی ئەبی سوفیان وەك فەرمانداری بەسرە دەست نیشان بکات. کوڕی عامر گفتوگۆی لەگەڵدا کرد و وتی: من لەبەسرە سامانی زۆرم بەجێهێشتوە، ئەگەر من وەك فەرمانداری بەسرە دەست نیشان نەکەیت، هەمو سامانەکانم بەفیرۆ دەچێت. معاویە ئەوی وەك فەرمانداری بەسرە دەست نیشان کرد. ئەو لەکۆتایی ساڵی چل و یەك /٦٦١ زایینی ڕۆشتە ئەو شارە. معاویە خوراسان و سیستانی پەیوەستی فەرمانڕەواییەکەی ئەو کرد. ئەو حەبیب کوڕی شەهابی کردە سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی و عێمەیرە کوڕی یەسرب برای عەمرۆی وەك سەرپەرەستی دامەزراوەی داد دەستنیشان کرد. لەگێڕانەوەی شەڕی وشتر ئاماژەی پێدرا کەعێمەیرە لەم شەڕەدا کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: کوژراو عەمرۆ بو. و خوا دەزانێت کامیان راستە.

## فەرمانداری قەیس کوڕی هەیسەم لەخوراسان

کوڕی عامر لەم ساڵەدا قەیس کوڕی هەیسەمی سولەمی وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد. لەم کاتەدا خەڵکی بادغیس وهەرات و پوشەنگ پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو. ئەو بەرەو بەڵخ بەرێکەوت و(نەوبەهاری) نەوێی وێران کرد. ئەو کەسەی ئەم کارەی گرتە ئەستۆ، عەتا کوڕی سایب لەبەنی لەیس بو کەپێیان دەوت (خشك) چونکە یەکەم کەس لەموسوڵمانان بو لەدەروازەی خشکەوە ڕۆشتە ناو شاری هەرات و لەسەر سێ پرد لەپردەکانی بەڵخ لەیەك فەرسەخی شار پردێکی هەڵبەست کەپێیان دەوت (پردەکانی عەتا).

دواتر خەڵکی بەڵخ خوازیاری ئاشتی بون و پەیمانیان بەست گوێرایەڵ بن و قەیس لەگەڵ ئەوان ئاشتی کرد. دەستەیەك دەڵێن: رەبیع کوڕی زیاد لەساڵی ٥١/ ٦٧١ زایینی لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی بەست. لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین. قەیس ڕۆشتە لای کوڕی عامر، کوڕی عامر لێیدا و خستیە زیندانەوە و عەبدالله کوڕی خازمی وەك فەرماندار دەست نیشان کرد. خەڵکی هەرات و بادغیس و پوشەنگ پەیکی خۆیان رەوانە کرد و داوای ئەمان و ئاشتیان کرد. ئەو لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی بەست و بەشێك لەسامانەکانی بۆ کوڕی عامر رەوانە کرد.

## شۆڕشی سەهم کوڕی غالب

لەم ساڵەدا سەهم کوڕی غالبی هوجەیمی لەگەڵ حەفتا پیاو دژی کوڕی عامر شۆڕشی کرد. یەکێك لەوان خەتەیمی باهلی بو کەناوەکەی خۆی یەزید کوڕی مالکە. لەبەر ئەوە پێیان دەوت (خەتیم) (لوت شکاو) چونکە لێدانێك بەر روخساری کەوتبو. ئەوان لەنێوان دو پرد و بەسرە دابەزین. عوبادە کوڕی فورصی لەیسی کە لەشەڕ لەرێگای خوا دەگەڕایەوە، لەگەڵ کوڕەکەی و کوڕی براکەی لای ئەوان تێپەڕی کرد. خەواریج پرسیان: کێن؟ وتیان: خەڵکانێکی موسوڵمانین. خەواریج وتیان: درۆ دەکەن. عوبادە وتی: پەنا بەخوا، ئەوەی پێغەمبەری خوا پێی رازی بو، پێی رازی بن. من ئەوم بەدرۆزن ناوبرد و شەڕم لەگەڵدا کرد و دواتر ڕۆشتمە لای ئەو باوەڕم هێنا وئەو رازی

بو. خەواریج وتیان: خوا نەناس و بێ باوەڕن. ئەویان لەگەڵ کوڕەکەی و کوڕی براکەیدا کوشت. کوڕی عامر خۆی بۆ شەڕی ئەوان ڕۆیشت و شەڕی لەگەڵ کردن و ژمارەیەك لەوانی کوشت و پاشماوەکانیان کەخەتیم و سەهم لەناویاندا بون، پەنایان بۆ دارستانێك برد. کوڕی عامر ئەمانی پێ پێشنیار کرد و رازی بون. ئەمانی پێبەخشین و ئەوان گەڕانەوە. معاویە نامەی بۆ نوسی و فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد. کوڕی عامر وەڵامی دایەوە: من لەلایەن تۆوە ئەمانم پێ بەخشیون.

کاتێك لەساڵی چل و پێنج / ٦٦٥ زایینی زیاد کوڕی نوبیە بو بەفەرمانداری بەسرە، سەهم و خەتیم هەڵاتن و رویان لەئەهواز کرد. دەستەیەك لەدەوری سەهم کۆبونەوە و ئەو هاورێ لەگەڵ ئەوان روی لەبەسرە کرد و دەستەیەك لەخەڵکانیان گرت. ئەوان وتیان: جولەکەین. ئەوانی ئازاد کرد (چونکە ئەگەر دەیانوت موسوڵمانین، ئەوانی سەر دەبڕی). ئەو سەعد کۆیلەی قودامە کوڕی مەزعونی کوشت. کاتێك گەیشتە شاری بەسرە، هاورێکانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد و سەهم خۆی داشارد. دەستەیەك دەڵێن: ئەوان دوای خۆشاردنەوەی سەهم بڵاوەیان لێکرد. ئەو داوای ئەمانی کرد و گومانی کرد ئەوەی کوڕی عامر پێی بەخشی، زیادیش پێی دەبەخشێت. کوڕی زیاد ئەوی ئەمان نەدا و بەدوایدا گەڕا و دەستەیەك جێگەکەی ئەویان نیشاندا و زیاد گرتی و کوشتی و لەماڵەکەیدا لەداریدا.

دەستەیەك دەڵێن: بەردەوام بەنهێنی دەژیا تا زیاد مرد و عوبەیدالله کوڕی زیاد لەساڵی ٥٤/ ٦٧٤ زایینی ئەوی گرت و لەداریدا. دەستەیەك دەڵێن: پێش ئەمە رویدا.

پیاوێك لەخەواریج وتی:

فان تكن الاحزاب باؤوا بصلبه فلا يبعدن الله سهم كوري غالب

یانی: ئەگەر ئەمانە توانیان لەداری بدەن، ئاگادار بن کەخواوەند سەهم کوڕی غالب لەسەری خۆی دور کاتەوە.

بەڵام خەتیم، زیاد لەعوبادە سەبارەت بەکوشتنی ئەو پرسیاری کرد کەوتی: هیچ نازانم. ئەوی ردوانەی بەحرەین کرد و دواتر گەڕاندیەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس لەدایك بو. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی چل /٦٦٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا و ئەمە پێش کوژرانی عەلی بو. وتاری یەکەم راسترە. ئەویان لەبەر ناوی عەلی کوڕی ئەبی تالب بەو ناوە ناونا. کوڕی عەباس وتی: ئەوم بەناوی خۆشەویسترینی خەڵکانەوە ناو نا.

لەم ساڵەدا عەتەبە کوڕی ئەبی سوفیان یا عەنبەسە کوڕی ئەبی سوفیان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عاص کوڕە پورەکەی خۆی عوقەبە کوڕی نافع کوڕی عەبدقەیسی وەك فەرمانڕەوایی ئەفریقیە دەست نیشان کرد و بەمشێوەیە سەرزەمینەکانی لواتە و مەزاتە ملکەچی بون. خەڵکی ئەم شارانە سەرەتا فەرمانیان برد و دواتر لەدین هەڵگەڕانەوە. ئەو لەهەمان ساڵ شەڕی لەگەڵ کردن و دەستەیەکی فراوانی لێ کوشتار کردن و دەستەیەکی بەئەسیری گرت و دواتر لەساڵی چل و دو /٦٦٢ زایینی هێرشی کردە سەر غودامس و کوشتاری کرد و دیلی گرت و لەساڵی چل و سێ / ٦٦٣ زایینی دەستی بەسەر یەکێك لەشارەکانی سودان گرت. هەروەها وەدانی گرت کەهەمان بەرقەیە. دەستی بەسەر هەمو سەرزەمینی بەربەریەکانیشدا گرت. ئەو لەساڵی پەنجا /٦٧٠ زایینی بناغەی شاری قیراوانی دانا. بەخواستی خوا لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

هەروەا لەم ساڵەدا شاعیر لەبید کوڕی رەبیعە مرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو رۆژە مرد کەمعاویە هاتە ناو کوفە و لەم کاتەدا تەمەنی سەد و پەنجا و حەوت ساڵ بو. دەستەیەك دەڵێن: لەکاتی خەلافەتی عوسمان مرد و ئەو چاوی بەپێغەمبەر کەوتوە. لەو رۆژەوەی باوەڕی هێنا، شێعر وتنی پشت گوێ خست.

## رووداوەکانی ساڵی چل و دووەمی کۆچی ( ٦٦٢ زایینی )

لەم ساڵەدا موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر لان و ڕۆمیان کردە ئامانجی هێرشەکانی خۆیان. بە قورسترین شێوە ڕۆمیەکانیان شکەستدا و دەستەیەکی فراوان لەبەتریقەکانی ئەوانیان کوشت.

بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا حەجاج کوڕی یوسف چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە مەروان کوڕی حەکەمی وەك فەرمانداری مەدینە دەست نیشان کرد و خالید کوڕی عاص کوڕی هاشمی وەك فەرمانداری مەککە. مەروان داوای لەعەبدالله کوڕی حارس کوڕی نەوفل کرد سەرپەرەستی دامەزراوەی داد بێت.

فەرمانداری کوفە موغەیرە کوڕی شەعبە وسەرپەرەستی دامەزراوەی داد شورەیح و فەرمانداری خوراسان قەیس کوڕی هەیسەم بو. کوڕی عامر قەیس کوڕی هەیسەمی هێنایە سەر تەخت. دەستەیەك دەڵێن: کاتێك کاروبارەکان بۆ معاویە ئارامیان گرت، قەیسی کردە فەرمانداری خوراسان و کاتێك کوڕی عامر بو بەفەرمانداری بەسرە، قەیسی لەپۆستەکەیدا هێشتەوە.

## بزوتنەوەی خەواریج

لەم ساڵەدا خەواریج شۆڕشیان کرد. ئەوان هەڵاتوانی شەڕی نەهرەوان و برینداڕەکانی ئەو شەڕە بون کەباش بونەوە و عەلی لەوان خۆش بو. هۆکاری شۆڕشەکەیان ئەوە بو حەیان کوڕی زەبیانی سولەمی پیاوێك بو لەخەواریج کەنیوە گیان لەگۆڕەپانی نەهرەوان بڕایەدەر. کاتێك چاك بویەوە، هاورێ لەگەڵ پیاوە شەرکەرەکانی خۆی بەرەو ڕەی بەرێکەوت. ئەوان لەوێ مانەوە تا هەواڵی کوژرانی عەلیان پێگەیشت. سیانزە کەس بون کەیەکیان سالم کوڕی ڕەبیعەی عەبەسی بو. حەیان ئەوانی لەکوژرانی عەلی ئاگادار کردەوە و سالم وتی: خۆش بێت ئەو دەستەی شمشێری بۆ کوشتنی ئەو بەرز کردەوە. ئەوان بۆ کوژرانی ئەو سوپاسی خوایان کرد. ماوەیەك دواتر سالم لەئایینی خەواریج هەڵگەڕایەوە. حەیان ئەوانی بۆ شۆڕش و شەڕ دژی موسوڵمانان هاندا و رویان لەکوفە کرد و لەوێ مانەوە تا معاویە ڕۆشتە ئەو شارە و

موغەیرە کوڕی شەعبەی وەك فەرماندار دەست نیشان کرد. معاویە خوازیاری ئارامی و ئاسایش بوو لەبەر ئەمە هەڵس و کەوتێکی نەرم و نیانی لەگەڵ خەڵك گرتەبەر. کەسێك دەڕۆشتە لای و دەیوت: فلان کەس لەشوێنکەوتوانی عەلیە و فیسارە کەس لەسەر بڕوای خەواریج ژیان بەسەر دەبات. معاویە دەیوت:خوا بەم شێوە فەرمانی داوە کەخەڵك لەئەندێشە و باوەڕەکان ناسازگار و جۆراوجۆر بن، خوا خۆی لەنێوان ئەوان داوەری دەکات. خەڵك لەو ئارامیان پێبڕا.

خەواریج یەکیان دەبینی و شوێنی براکانیان لەنەهرەوان بیر دەهێنایەوە. ئەوان لەسەر سێ کەس هاوپەیمان بون: موستەوردی کوڕی عەلەفە تەیمی لەتەیم ئەلرباب، مەعاز کوڕی جوەینی تایی (کوڕە مامی زەید کوڕی حوصەین کە لەشەڕی نەهرەوان کوژرا) و حەیان کوڕی زوبیانی سولەمی. ژمارەیان گەیشتە چوارسەد کەس و لەناو خۆیاندا راوێژیان کرد بۆ ئەوەی یەکێك وەك رێبەری خۆیان هەڵبژێرن. کەس بەفەرماندەیی رازی نەدەبو. دواتر رێککەوتن و موستەوردیان وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد و پەیمانیان لەگەڵ بەست. ئەمە لەجەمادی الثانی / سێپتامبەر – ئۆکتۆبەری ٦٦٢ زایینی رویدا. بۆ شۆڕش ئامادە بون و شوێنێکیان بۆ کۆبونەوە دیاری کرد. شۆڕشی ئەوان لەیەکی شەعبانی ساڵی چل و سێ / ٨ نۆڤەمبەری ٦٦٣ زایینی رویدا.

## ڕۆیشتنی زیاد بۆ لای معاویە

لەم ساڵەدا زیاد کوڕی ئوبیە لەفارسەوە هاتە لای معاویە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو زیاد سامانەکەی خۆی لای عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکرە دانابو و عەبدولرەحمان سەرپەرەستی سامانەکانی ئەوی لەبەسرە لەدەستابو. معاویە بەمەی زانی. موغەیرە کوڕی شەعبەی رەوانە کرد تا ئەندازە و فراوانی سامانەکەی بزانێت. ئەو عەبدولرەحمانی گرت و وتی: ئەگەر باوکت لەحەقی مندا خراپەی کردوە، مامی تۆ یانی زیاد چاکەکی زۆری لەگەڵدا کردوم. ئەو بۆ معاویەی نوسی: من لەدەستی عەبدولرەحمان شتێکی ئەوتۆم نەبینی گرتنەکەی بەرەوا بزانم. معاویە بۆی نوسی: عەبدولرەحمان ئەشکەنجە بکە. موغەیرە مەبەستی ئەوەی کرد هیچ بیانوێك بۆ معاویە نەهێڵێتەوە (بێ ئەوەی معاویە ئەشکەنجە بکات) هەواڵی ئەم

کارە بەمعاویە گەیشت. موغەیرە بەعەبدولرەحمانی وت: ئەوەی لەدەستی خۆتدایە، بیپارێزە. پارچەیەکی هەوریشمینی خستە سەر روخساری و بەئاو تەڕی کرد و عەبدولرەحمان لەهۆش چو. سێ جار ئەم کارەی کرد و نامەی بۆ معاویە نوسی کە: من ئەشکەنجەم کرد بەڵام هیچم دەست نەکەوت. ئەو لای خۆی رێزی زیاد کوڕی ئوبیەی گرت. دواتر موغەیرە ڕۆشتە لای معاویە، کاتێك معاویە ئەوی بینی وتی:

| | |
|---|---|
| انما موجع سر المرو ان | باح بالسر اخوه المنتصح |
| فاذا بحت بسر فالی | ناصح یسترە او لا تبح |

یانی: شوێنی سپاردنی نهێنی مرد (ئاشکرابو) ئەگەر بیەوێت ئاشکرای بکات، برای چاکەخوازی ئەوە. ئەگەر مەبەستی ئەوت کرد نهێنیەك ئاشکرا بکەیت، بەچاکەخوازی بیڵێ تا بەنهێنی بیپارێزێت و گەرنە زمان بۆ وتنی مەکەرەوە؟

موغەیرە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر نهێنی خۆت بەمن بسپێریت، بەچاکەخوازێکی مێهرەبانت سپاردوە، ئەوە چیە و بە چ شێوەیەکە؟

معاویە وتی: دوێ شەو بیری زیاد کوڕی ئوبیە کەوتم و بەهێزی ئەوم لەبەرچاو تێپەڕاند و لەبەر ئەمە خەوم لێنەکەوت. موغەیرە وتی: زیاد لەوێ چ بەهایەکی هەیە؟ معاویە وتی: وشیارترینی خەڵکانی عەرەبە و سامانی خەڵکی فارس لەدەستی ئەودایە. کاروبارەکان سامان دەدات و چارەسەرەکان دەدۆزێتەوە. لەوە دەترسم لەگەڵ پیاوێك لەم بنەماڵە (بنەماڵەی عەلی) پەیمان ببەستێت و لەناکاو ببینم ئاگری شەڕی دژی من زیاتر لەجاران خۆش کردبێت. موغەیرە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ئایا ڕێگەم پێ دەدەیت بڕۆمە لای؟ وتی: بەڵێ، بڕۆ لای ئەو و بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکە.

موغەیرە ڕۆشتە لای زیاد و پێی وت: کاتێك معاویە منی بۆ لای تۆ رەوانە کرد، ترس ئارامی لێ بڕیبو. تۆ باش دەزانی جگە لەحەسەن کوڕی عەلی کەس نەبو بتوانێت بەم کارە هەستێت و ئەویش لەگەڵ معاویە بەیعەتی کردوە. پێش ئەوەی هەمو کاروبارەکان جێگیر و سەقامیگر بێت، چارەیەك بۆ خۆت بدۆزەرەوە با ئەو کاتە نەگات کەپێویستی بەتۆ نەبێت. زیاد وتی: بۆچونی راست بەمن بڵێ و دورترین مەبەست بکەرە نیشانە چونکە راوێژکار، ئەمینی ئەو کەسەیە داوای ڕێنوێنی لێ دەکات.

موغەیرە وتی: پێم باشە پەیوەندی خۆت لەگەڵ ئەودا بەهێز بکەیت و رو بکەیتە دەربارەکەی ئەو تا خوا فەرمانی خۆی رەوانە بکات. دوای گەڕانەوەی موغەیرە، معاویە نامەی بۆ زیاد نوسی و ئەمانی پێ بەخشی. زیاد لەفارسەوە بەمەبەستی سەردانی دەرباری معاویە بەرێکەوت و مێنجاب کوڕی راشدی زەببی و حارسە کوڕی بەدری غودانی لەگەڵ ئەودا بون.

عەبداللە کوڕی عامر، عوبەیداللە کوڕی خازمی هاوریێ لەگەڵ دەستەیەك بۆ فارس رەوانە کرد و وتی: ئەگەری هەیە لەرێگادا زیاد ببینیت و بازداشتی بکەیت. کوڕی خازم بەرێکەوت و لەئەرجان چاوی بە زیاد کەوت و جڵەوی ئەسپەکەی ئەوی گرت و وتی: ئەی زیاد، دابەزە. مێنجاب وتی: لەبەرچاومان ونبە ئەی کوڕی ژنی ڕەش روخسار و گەرنە دەستت بەجڵەوی ئەسپەکەوە دەبەستمەوە. لەناو ئەوان بگرە و بێنە بو. زیاد وتی: معاویە نامەی بۆ نوسیم و ئەمانی پێ بەخشیوم. کوڕی خازم ئازادی کرد و زیاد رۆشتە لای معاویە. معاویە سەبارەت بەسامانەکانی فارس پرسیاری لێکرد. زیاد ئاگاداری کردەوە کەچەندەی بۆ عەلی رەوانە کردوە و چەندەی لەرێگە پێویستەکاندا خەرج کردوە و چەندە لەسامانەکان لای ئەو ماوەتەوە. معاویە قسەکانی سەبارەت بەوەی خەرجی کردوە و ئەوەی لای ئەو ماوەتەوە، بەراست زانی و لێی وەرگرتەوە.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك زیاد بەمعاویەی وت برێك لەسامانەکان لای من ماوە و لەشوێنێکی بەهێزدا هەڵمگرتوە، معاویە سەری سوڕما و ئەو قسانەی لەگەڵ خۆیدا دوبارە کردوە. زیاد بۆ ئەو خەڵکەی سامانەکانی لای ئەوان دانابو، نامەی نوسی و بەوانی وت: ئێوە دەزانن چەندەم سامان لای ئێوە داناوە، نوسراوی خوا بێنە بیری خۆتان کەدەڵێت: ئێمە ئەمانەتیمان بەئاسمان و کێو و زەوی پێشنیار کرد، رازی نەبون هەڵیبگرن و ترسیان کەوتە دڵەوە، مرۆڤ رازی بو چونکە ستەمکارە و نەزان (احزاب /٧٢/٣٣). لەبەر ئەمە داواتان لێدەکەم ئەوەی لای ئێوەیە، بیپارێزن. زیاد ئەو برە پارەی لای معاویە دیاری کردبو، دەست نیشان کرد و بەنێردراوەکەی خۆی وت لەگەڵ ئەو کەسانەی هەواڵدەکان بۆ معاویە دەگوێزنەوە، گفتوگۆ بکات.

نێردراوەکە ئەم کارەی کرد و هەواڵەکە بڵاو بویەوە. کاتێك معاویە لەنامەکانی زیاد ئاگادار بویەوە، پێی وت: بەردەوام دەترسم فێڵت لێ کردبێتم، لەسەر بنەمای هەر

شتێك دڵت دەیخوازێت، لەگەڵ من ئاشتی بکە. ئەو لەسەر بنەمای شتێك پەیمانی لەگەڵ معاویە بەست و بۆی برد، بڕەکەی هەزار هەزار (یەك ملیۆن درەم) بو. زیاد کوڕی ئوبیە داوای مۆڵەتی لەمعاویە کرد تا لەکوفە بمێنێتەوە و معاویە ڕێگەی پێدا. موغەیرە ڕێزی زۆری لێگرت. معاویە نامەی بۆ موغەیرە نوسی و فەرمانی پێدا زیاد کوڕی ئوبیە و حوجر کوڕی عودەی و سولەیمان کوڕی صورد و شەبەس کوڕی رەبعی و کوڕی کەوا کوڕی حەمیق ناچار بکات لەنوێژی هەینیدا بەشدار بن. لەبەر ئەمە ئەوان دەهاتن ولەپشت سەری ئەو نوێژیان دەخوێند. بۆیە بەم کارە ناچاری کردن چونکە ئەوان شوێنکەوتوانی عەلی بون.

## بیر کردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەنبەسە کوڕی ئەبی سوفیان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەبیب کوڕی مەسلەمەی فیهری فەرمانداری معاویە لەئەرمەنستان، لەوێ کۆچی دوایی کرد. ئەو لەهەمو شەڕەکان لەبەرژەوەندی معاویە شەڕی کردبو.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی تەڵحە کوڕی ئەبی تەڵحەی عەبدەری کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو،ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

لەم ساڵەدا روکانە کوڕی عەبد یەزید کوڕی هاشم کوڕی عەبدولموتەلیب مرد. ئەو بو لەگەڵ پێغەمبەر زۆرانی گرت.

هەروەها صەفوان کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف جومەحی لەم ساڵەدا ماڵئاوایی لەجیهان کرد. ئەویش چاوی بەپێغەمبەر کەوتبو.

هەروەها لەم ساڵەدا هانی کوڕی نیار کوڕی عەمرۆ ئەنساری خاڵی بورائ کوڕی عازب لەبەدریەکان، مرد. دەستەیەك مەرگی ئەو بۆ ساڵی ٤٥ /٦٦٥ زایینی دەگێڕنەوە. ئەو لەبەیعەتی عەقەبە ئامادە بو.

## ڕوداوەکانی ساڵی چل و سێی کۆچی (٦٦٣ زایینی)

لەم ساڵەدا بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا بۆ شەڕی ڕۆمیەکان ڕۆشتەدەر و زستانی لەسەرزەمینی ڕۆمیەکان بەسەر برد تا بە(وتەی واقدی) گەیشتە کۆنستانتین نۆپێل. دەستەیەك لەمێژوونوسان ئەمەیان بەناڕاست زانیوە و وتویانە: بوسر هەرگیز هیچ کات زستانی لەسەرزەمینی ڕۆمدا بەسەر نەبردوە.

لەم ساڵەدا لەڕۆژی ڕۆژو شکاندن (جەژنی ڕۆژو شکاندن) ٦ ژانویەی ٦٦٤ زایینی عەمرۆ کوڕی عاص لەمیسر مرد. ئەو لەکاتی عومەردا چوار ساڵ، لەکاتی عوسمان چوار ساڵ و دو مانگ کەمتر و بۆ معاویە دو ساڵ و یەك مانگ کەمتر فەرمانڕەوایەتی ئەم سەرزەمینەی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە عەبداللە کوڕی عەمرۆعاصی وەك فەرمانداری میسر دەست نیشان کرد کە بۆ ماوەی دو ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی صەفەر / مەی ٦٦٣ زایینی موحەممەد کوڕی موسلیمە لەمەدینە کۆچی دوایی کرد و مەروان کوڕی حەکەم نوێژی لەسەر خوێند. ئەو حەفتا و حەوت ساڵ ژیا.

## کوژرانی موستەوردی خەواریج

لەم ساڵەدا موستەورد کوڕی عولەفەی تەیمی لەخەڵکی تیم ئەلرباب مرد. ئەم باسە لەگێڕانەوەی ڕوداوەکانی ساڵی ٤٢ /٦٦٢ زایینی ئاماژە پێداوە کەبزوتنەوەی خەواریج سەریهەڵدا و ئەویان کردە سەر کردەی خۆیان و بەسەروەری باوەڕداران ناویان برد.

کاتێك ئەم ساڵە گەیشت، موغەیرە کوڕی شەعبەیان ئاگادار کردەوە کەئەوان لەماڵی حەیان کوڕی زوبیان سولەمی کۆبونەوە و هاوپەیمان بون تا لەیەکەمی شەعبان / ٨ نۆڤەمبەری ٦٦٣ زایینی شۆڕش دەست پێبکەن. موغەیرە سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی قەبیصە کوڕی دەمونی ڕەوانە کرد کەڕۆشت و ماڵی حەیان و کەسەکانی ناو ماڵەکەی گەمارۆدا. بینی مەعاز کوڕی جومین لەگەڵ نزیکەی بیست کەس لای ئەون.

ژنەکەی کە(دایکی منالّ) و لەمێردەکەی خۆی بێزار بو، هەستا و شمشێرەکانی ئەوانی هەڵگرت و لەناو نوێنەکاندا شاردیەوە. ئەوان هەستان تا شمشێرەکانیان هەڵبگرن بەلاّم نەیاندۆزیەوە و خۆیان تەسلیمی پاسەوانەکان کرد. ئەوانیان بردە لای موغەیرە کەسەرەتا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردن و لەبەر ئەوەی هیچ شتێکیان نەوت ئەوانی خستە زیندانەوە چونکە ئەوان وتیان: بۆ خوێندنەوەی قورئان کۆببوینەوە. ئەوان تای یەك سالّ زیندانی بون و هاوتاکانیان بەسەرهاتی ئەوانیان بیست و بەترس و وشیاریەوە هەڵس و کەوتیان کرد. گەورەی ئەوان مەستوەردی خەواریج هاتەدەر و لەحیرە دابەزی و خەواریج هاتوچۆیان بۆ لای ئەو دەست پێکرد. حەجار کوڕی ئەبجەر ئەوانی بینی و ئەوان داوایان لێکرد هەمان شەو نهێنی ئەوان بەشاراوەیی بهێڵێتەوە. ئەو بەوانی وت: نهێنیەکەی ئێوە تا کۆتایی تەمەن دەپارێزم. لەگەڵ ئەمەیشدا ترسان موغەیرە کوڕی شەعبە لەچۆنیەتی کاری ئەوان ئاگادار بکاتەوە. لەبەر ئەمە بۆ مالّی سولەیم کوڕی مەحدوجی عەبدی کەزاوای مەستوەرد بو، ڕۆشتن. حەجار هیچ کات نهێنیەکەی ئەوانی نەدرکاند.

هەواڵی کاری ئەوان بەموغەیرە گەیشت و ئاگادار بویەوە ئەوان دەیانەوێت لەو ڕۆژانەدا شۆڕش دەست پێبکەن. ئەو لەناو خەڵکەکەی وتارێکی پێش کەش کرد، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: ئێوە باش دەزانن من بۆ کۆمەلاّنی خەڵك بەردەوام خوازیاری بەختەوەری و کامەرانی دەکەم و ئازار و زیانم لەئێوە دور کردۆتەوە. لەسەرەتاوە ترسی ئەوم بو ئەم شێوازە، فێرکاریەکەی نابەجێ بۆ نەزانەکانی ئێوە بێت و دەترسام چارەیەکم جگە لەوە نەبێت کەفەرمانێکی خۆپارێزم بەگوناحی نەزانەکان لەناو بردبێت. ئێستا فەرمان بەئێوە دەدەم نەزانەکانی خۆتان لەم کارە بەدور بگرن پێش ئەوەی تاقی کردنەوە و گرفتاری داوێنی هەموان بگرێت. ئاگادار بوینەتەوە چەند کەسێك لەپیاوان دەیانەوێت لەم شارەدا دوبەرەکی دروست بکەن و ناسازگاری دەست پێبکەن. سوێند بەخوا، ئەوان لەناو هیچ کام لەخەڵکانی عەرەب پەنا نادرێن مەگەر ئەوەی لەناویان ببەم و بیانکەم بەوانەیەك بۆ داهاتوان.

مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی هەستا و وتی: ئەی فەرماندار، ئێمە لەناو و نیشانی ئەوان ئاگادار بکەرەوە. ئەگەر لەخەڵکانی ئێمە بن، قورسایی ئەو کارە لەسەر شانی تۆ

هەڵدەگرین و ئەگەر لەخەڵکانی ئێمە نەبن، فەرمان بەفەرمانبەران بدە هەر هۆزێك نەزانەکانیان بێننە لای تۆ. موغەیرە وتی: ناوی کەسیان بەمن نەوتوە. مەعقەل وتی: من قورسایی خەڵکەکەی خۆم لەسەر شانی تۆ هەڵدەگرم، دەبێت هەر سەرکردەیەك ئەو کارە بکات. موغەیرە سەرکردەکانی بانگ کرد و پێی وتن: دەبێت هەر کام لەئێوە چارەسەری خەڵکەکی بکات وەگەر نە سوێند بەخوا هەڵس و کەوت و شێوازی خۆم دەگۆڕم و شێوازێك دەگرمەبەر کەبەتەواوی لێی بێزارن.

هەرکام لەوان ڕۆشتە لای خەڵکەکەی خۆی سوێندیان دان تا ئەوانەی دەیانەوێت شۆڕش و ئاژاوە دەست پێبکەن، بەوان بناسێنن. صەعصەعە کوڕی صوحان ڕۆشتە لای خەڵکی عەبدقەیس (چونکە دەیزانی حەیان کوڕی زوبیان لەماڵی سولەیم کوڕی مەحدوج دابەزیوە) بەڵام پەسەندی نەکرد کەس لەخەڵکەکەی دەستگیر بکرێت چونکە لەخەڵکانی شام دور و لەباوەڕی ئەوان بێزار بو. هەروەها نەیدەویست هیچ بنەماڵەیەك لەخەڵکەکەی خۆی بڕەنجێنێت.. لەناو ئەواندا وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، خوا، ئەو کاتەی لەپێشی دابەش دەکرد، بەهەرمیەکی گەورەی بەئێوە بەخشی. ئێوە باوەڕتان بەئایینی هەڵبژێردراوی خوا کرد، پێغەمبەر و فریشتەکانتان پەسەند کرد و وڵامی بانگەوازەکەی ئەوتان دایەوە. دواتر خۆڕاگر مانەوە تا پێغەمبەر لەم جیهانە ماڵئاوایی کرد. دوای ئەو، خەڵك لەناو خۆیاندا ناسازگاریان گرتەبەر، دەستەیەك مانەوە و دەستەیەك لەدین هەڵگەڕانەوە، دەستەیەك ئەوەی لەدڵیاندا بو ئاشکرایان کرد و دەستەیەك هیچیان نەوت و چاوەڕوانی داهاتویان دەکرد. ئێوە لەسەر ئایینی خواوەند مانەوە و ئەمە لەسەر بنەمای باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی بو، شەری هەڵگەراوەکانتان کرد تا ئەم ئایینە خۆی گرت و خوا ستەمکارانی لەناو برد. خوا بەردەوام لەم ڕێگاوە چاکەی ئێوەی زیاد دەکرد تا خەڵك لەناو خۆیاندا ناکۆك و ناتەبا بون. دەستەیەك وتیان: زوبەیر و تەڵحە و عایشەمان دەوێت، دەستەیەك وتیان: خەڵکانی رۆژئاوامان دەوێت، دەستەیەك وتیان: عەبداللە کوڕی وەهبی راسبیمان دەوێت، ئێوە وتتان: تەنیا بنەماڵەی پێغەمبەرمان دەوێت چونکە خوای گەورە لەرێگەی ئەوانەوە ئێمەی بەرێز کرد. ئەمە ئەو شتە بو خوای گەورە بەئێوەی بەخشی و ئەو بەختەوەریە بو خواوەند بۆ ئێوەی بەپەسەند زانی.

ئێوە بەردەوام لەسەر راستی و دروستی خۆڕاگر بون تا خوا بەهاوکاری ئێوە و کەسانی هاوشێوەی ئێوە، پەیمان شکێنەکانی لەشەڕی وشتر لەناو برد و لەدین هەڵاتوانی لەشەڕی نەهرەوان کوشتار کرد (باسی شامیەکانی نەکرد چونکە پاشایەتی لەدەستی ئەواندا بو). هیچ کەس نیە لەگەڵ ئێوە و لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەر لەهەڵگەڕاوە تاوانبارەکان دوژمنتر بێت. ئەوان خۆیان لەرێبەرەکەی ئێمە بەدور گرت و ڕشتنی خوێنی ئێمەیان بەڕەوا زانی و شایەتیان بۆ ناباوەڕی ئێمەدا. ئێستا ئاگادار بن و ئەوان لەماڵەکانی خۆتان پەنا مەدەن و کارەکانی ئەوان مەشارنەوە چونکە بۆ هیچ هۆزێك لەهۆزەکانی عەرەب شیاو نیە زیاتر لەئێوە دوژمنایەتی ئەوان بکەن. منیان ئاگادار کردۆتەوە دەستەیەك لەوان لەم ناوچەیەدان. من لەمبارەوە لێکۆڵینەوە دەکەم و ئەگەر بزانم ئەم هەواڵانە راستە بەڕشتنی خوێنی ئەوان خۆم لەخوا نزیك دەکەمەوە چونکە کوشتنی ئەوان ڕەوایە.

هەروەها وتی: ئەی خەڵکی عەبدقەیس، فەرمانڕەوایانی ئێمە زیاتر لەهەر شتێك لەئێوە و بۆچون و باوەڕتان ئاگادارن. کەواتە رێگەیەك دژی خۆتان بۆ ئەوان مەهێڵنەوە چونکە ئەوان زیاتر لەهەر شتێك خوازیارن بەرەو لای ئێوە و کەسانی هاوشێوەی ئێوە بێن. دواتر بێدەنگ بو. هەر هۆزێك وتی: نەفرەتی خوا لەوان بێت، لێیان بێزارین و پەنایان نادەین و ئەگەر بزانین لەکوێن، ئێوە ئاگادار دەکەینەوە. تەنیا سولەیم کوڕی مەحدوج هیچی نەوت و خەمبار و نیگەران گەڕایەوە چونکە پەسەندی نەدەکرد هاورێکانی لەماڵەکەی خۆی دەربکات لەبەر ئەوەی دەبوە هۆکارێك بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو، هەروەها نەیدەویست لەماڵەکەی ئەودا ئەسیر بکرێن و بکوژرێن وئەویش لەگەڵ ئەواندا تیا بچێت.

هاوەڵانی موستەورد کۆبونەوە و ئاگاداریان کردەوە کەموغەیرە بەچ کارێك هەستاوە وسەرکردەی خەڵکان سەرقاڵی چ کارێکن. لەکوڕی مەحدوجی پرسی کەصەعصەعە کوڕی صوحان لەناو خەڵکدا چی وتوە. ئەو ئاگاداری کردنەوە. هەروەها وتی: نەمویست ئێوە ئاگادار بکەمەوە تا هەست نەکەن بونە ئەرکی سەرشانی من. پێی وت: رێزدارانە ماڵەکەی خۆت بەئێمە بەخشی و لەگەڵ ئێمەدا چاکەت کرد. ئێمە لەماڵەکەی تۆ کۆچ دەکەین.

ئەم هەواڵە بەگوێی چەند کەسێك لەخەواریج گەیشت کەلەزیندانەکەی موغەیرەدا بون. مەعاز کوڕی جومین کوڕی حوصەین لەمبارەوە وتی:

الا ايها الشارون قد حان لامرى — شرى نفسه لله ان يتر حلا
اقمتم بدار الخاطئين جهالة — و كل امرى منكم يصاد ليقتلا
فشدوا على القوم العداة فانما — اقامتكم للنبح رايا مضللا
الا فاقصدوا يا قوم للغاية التى — اذا ذكرت كانت ابر و اعدلا
فيا ليتنى فيكم علة ظهر سابح — شديد القصيرى و ارعا غير اعزلا
و يا ليتنى فيكم اعادى عدوكم — فيسقينى كاس المنية اولا
يعز على ان تخافوا و تطردوا — و لما اجرد فى المحلين منصلا
و لما يفرق جمعهم كل ماجد — اذا قلت قد ولى و ادبر اقبلا
مشيحا بنصل السيف فى حمس الوغى — يرة الصبر فى بعض المواطن امثلا
و عز على ان تصابوا و تنقصوا — و اصبح ذابث اسيرا مكبلا
و لو اننى فيكم و قد قصدوا لكم — اثرت اذا بين الفريقين قصطلا
فيارب جمع قد فللت و غرة — شهدت و قرن قد تركت مجدلا

یانی: های ئەی فرۆشیاران: بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت خۆی لەرێگەی خوادا بفرۆشێت، کاتی ئەوە هاتوە لەم جیهانە تێپەڕە کۆچ بکەن، ئێوە لەنەزانیدا لەماڵی گوناحکاراندا ماونەتەوە و ئێوە یەك یەك ڕاو دەکەن یا سەر دەبڕن. هێرش بکەنە سەر دوژمن چونکە مانەوەی ئێوە و چاوەڕوانی سەر بڕان لەئەندێشەی کەسێکی گومڕا دەچێت. ئەی خەڵکینە، مەبەستێك بکەنە نیشانە کەکاتێك بیری دەکەنەوە چاکەکارترین و دادپەروەرانە ترین بێت. خۆزگە سوار ئەسپێکی تیژپێی چالاك دەبوم کە کلکی خوار نەبێت و لەڕەشیدا بریقە بداتەوە. خۆزگە لەناو ئێوەدا دەبوم و لەگەڵ دوژمنانی ئێوە دوژمنایەتیم دەکرد تا یەکەم کەس دەبوم تامی مەرگم دەچێشت. بۆ من دژوارە ئێوە لەترسدا بن و بۆ هەمو شوێنێك دور بخرێنەوە و من هێشتا بۆ لەناو بردنی دوژمنەکەتان ڕمم ئامادە نەکردبێت و بەرزم نەکردبێتەوە، هێشتا هەر ڕێزدارێك بلاوەی بەسوپا گەورەکەی ئەوان نەکردبێت، ئەوەی وەك بڵێی پشتی تێکردون و هەلاتوە، بەپەلە بگەڕێتەوە و هێرش ببات. ئەوەی لێوی شمشێرەکەی خۆی

لەخوێنی دوژمنان تێراو کردبێت و لەگەرماو گەرمی جەنگ و لە هەر شوێنێکی گۆڕەپان، خۆڕاگری باشتر بناسێت. بۆ من دژوارە زیان بەئێوە بگات و ژمارەتان کەم ببێتەوە و من گرفتار و خەمبار دەست وپێ بەستراو لەزنجیردا بمێنمەوە. ئەگەر لەناو ئێوە دەبوم و ئاهەنگی ئێومیان دەکرد، بای گۆڕەپانم زیاد دەکرد و خاك و خۆڵم بەروخساری خراپەکاراندا دەباراند. بلاوەم بەسوپایەکی گەورە دەکرد و لەشەڕەکاندا ئازایەتیم لەخۆم نیشان دەدا و شەڕکەرانی زۆرم وەك دارێکی خوێناوی لەخاکی ڕەشی مەرگدا دەگەوزاند.

مەستومرد بۆ هاوەڵانی خۆی پەیامی نارد و وتی: لەناو ئەم خەڵکە بڕۆنەدەر و ئاهەنگی (سەورا) بکەن. ئەوان بەشێوەیەکی بەربلاو و لێکپچڕاو رویان لەو دیارە کرد و سێسەد پیاوی شەڕکەر لەوێ کۆبونەوە. دواتر ئاهەنگی (صەرات)یان کرد. موغەیرە کوڕی شەعبە لەم هەواڵە ئاگادار بویەوە و سەرکردەکانی خەڵکی بانگ کرد و راوێژی لەگەڵ کردن تا چ کەسێك بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە بکات. عودەی کوڕی حاتەم پێی وت: هەمومان دوژمنی ئەوانین، لەبیروباوەڕەکانیان بێزارین و ملکەچی فەرمانەکانی تۆین. هەر کەسێك دەخوازیت بۆ شەڕی ئەوان رەوانە بکە. . مەعقەل کوڕی قەیس بەوانی وت: هەمو ئەم کەسانەی لەدەوری تۆن گوێرایەڵ و فەرمانبرداری تۆن، ئێمە لەوان بێزارین و خوازیاری لەناوچونی ئەوانین. بڕوام وایە کەس نادۆزیتەوە زیاتر لەمن دوژمنی ئەوان بێت، من بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە بکە، چونکە بەفەرمانی خوای گەورە زیانی ئەوان لەتۆ دوردەکەمەوە. موغەیرە وتی: بەناوی خوا بەرێبکەوە! موغەیرە سێ هەزار شەڕکەری کۆکردەوە و لەگەڵ مەعقەلدا رەوانەی کرد. موغەیرە بەسەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی وت: لایەنگرانی عەلی لەسوپاکەی مەعقەلدا کۆبکەوە چونکە ئەو خۆی لایەنگری عەلیە. کاتێك شان بەشانی یەك شەڕ بکەن، بەخوو و نەریتەکانی یەك رازی دەبن. ئەوان زیاتر لە هەر کەسێك خوازیاری خوێنی خەواریجن و لەهەموی ئەوان بوێرتر، چونکە پێشتر شەڕیان لەگەڵ ئەوان ئەزمون کردوە. صەعصەعە کوڕی صوحان وەك مەعقەل کوڕی قەیس ئاخاوت. موغەیرە پێی وت: دانیشە چونکە تەنیا دەتوانیت قسە بکەیت. ئەم وتەیە بوە هۆی تورە بونی صەعصەعە.

بۆیە ئەم قسەی بەصەعصەعە وت چونکە ئاگاداریان کردەوە کە ئەو بوێرانە

سەرکۆنەی عوسمان دەکات و بەردەوام وەسفی عەلی دەکات و ئەو لەهەموان بە لەپێشتر دەزانێت. موغەیرە پێشتر بانگی کردبو و پێی وتبو: نامەوێت ببیستم سەرکۆنەی عوسمان دەکەیت و لەپێشی بەعەلی دەبەخشی چونکە من ئەوە باشتر لەتۆ دەزانم بەڵام ئەم دامەزراوەی فەرمانڕەوایی کاتێك دەرکەوت کەئێمە خراپەکانیمان بۆ خەڵك باس کرد. ئێستا زۆربەی ئەوەی فەرمانی پێ دەدەن، پشت گوێ دەخەین و وتەیەك دەهێنینە سەرزمان کە هیچ رێگە چارەیەکمان نیە بۆ ئەوەی زیانی ئەم خەڵکانە لەخۆمان دور بخەینەوە. ئەگەر دەتەوێت لەپێشی بەعەلی ببەخشی، دەبێت بەشێوەیەك نهێنی و لەناو هاورێکانتدا بێت. بەڵام خەلیفە ناتوانێت بەوە رازی بێت کەتۆ بەئاشکرا لەمزگەوت ئەو کارە دەکەیت. صەعصەعە پێی وت: ئەو کارە دەکەم. دواتر موغەیرە ئاگادار بویەوە ئەو کارەی کردوە بەڵام لەپێشیەکی زیاتر لەهەمو خەڵکانی بەعەلی بەخشیوە. لەبەر ئەمە، موغەیرە رقی ئەوی لەدڵ گرت و بەم شێوەیە وەڵامی ئەوی دایەوە. صەعصەعە پێی وت: ئایا من تەنیا دەتوانم قسە بکەم؟ سوێند بەخوا من قسەکەری بێزار نەبو و فەرمان دەرم. ئەگەر لەشەڕی وشتردا منت دەبینی کەرمەکەم چون دەسورێت و پەیکەرەکان لەت لەت و سەرەکان دەکەوتنە سەرخاك، بێ گومان دانت بەوەدا دەنا کەمن شێری راوکەری فیلم. موغەیرە وتی: تەواوی کە، سوێند بەخوا زمانێکی بەتوانایان بەتۆ بەخشیوە.

مەعقەل لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەرکەر لەلایەنگرانی عەلی بەرێکەوت و ئاهەنگی سەورا ی کرد و لەوێ هاورێکانی پەیوەستی بون.

بەڵام خەواریج، بەرەو بەهرسیر (بەهر شیر، نەهر شیر) بەرێکەوتن و مەبەستی ئەوەیان کرد لەوێ تێپەڕن و خۆیان بگەیێنە شاری کۆنە کەماڵی خوسرەوەکانی ئێران لەوێ بو. سێماك کوڕی عوبەیدی ئەزدی عەبەسی فەرمانداری ئەوێ، رێگەی لێ گرتن. مەستوەرد نامەی بۆ نوسی و داوای لێکرد بەئاشکرا بێزاری خۆی لەعوسمان و عەلی دەربڕێت و فەرمانی پێدا لایەنگری لەخۆی و هاورێکانی بکات. سێماك کوڕی عوبەید وتی: ئەگەر ئەم کارە بکەم، خراپترین پیرەپیاوی سەرزەویم. ئەم وەڵامەی بۆ مەستوەرد رەوانە کرد و داوای لێکرد لایەنگری لەبۆچونی کۆمەڵانی خەڵك بکات. مژدەی پێبەخشی کەئەمانی بۆ وەردەگرێت. مەستوەرد رازی نەبو و سێ رۆژ لەمەداین

مایەوە. دواتر هەواڵی پێگەیشت کەمەعقەل کوڕی قەیس بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوتوە. مەستوەرد ئەوانی کۆکردەوە و وتی: موغەیرە، مەعقەل کوڕی قەیسی بۆ شەڕی ئێوە رەوانە کردوە کە لەدەستەی سەبەئیەکانی درۆزنی درۆکەرە. بۆچونی خۆتان بەمن بڵێن. دەستەیەك وتیان: ئێمە بۆ رەزامەندی خوا و شەڕ کردن لەرێگەی ئەو هاتوینەتەدەر. بۆ کوێ بڕۆین؟ دەمێنینەوە تا خوا لەنێوان ئێمە داوەری بکات. دەستەیەکی دیکە وتیان: خۆمان لەوان بەدور دەگرین و بەپاڕانەوە لەخوا و داوا کردنی لەخەڵك، بەڵگەیان بۆ دەهێنینەوە. موستوەرد بەوانی وت: بەباشی نازانم بمێنینەوە و ئەوان کاتێك بەئێمە دەگەن، حەساوە بن. بڕوام وایە لەپێش ئەوان بڕۆین و ئەوان بەدوای ئێمەدا بگەڕێن و ببنە چەندین دەستە و بڵاوەی لێبکەن. ئێمە لەم کاتەدا روبەروی ئەوان دەبینەوە و شەڕیان لەگەڵ دەکەین.

ئەوان بەرێکەوتن و لەجەرجەرایا تێپەڕین و ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی جوخی و دواتر ڕۆشتنە مەزار و لەوێ مانەوە.

کوڕی عامر لەبەسرە بو، هەواڵی ئەوانی بیست و پرسی موغەیرە چی لەگەڵ ئەوان کردوە. ئەومیان لەبارودۆخ ئاگادار کردەوە. ئەو شەریك کوڕی ئەعومەری حارسی (لەلایەنگرانی عەلی) بانگ کرد و پێی وت: بۆ شەڕی خەواریج خۆت ئامادە بکە. شەریك خۆی ئامادە کرد و سێ هەزار پیاوی شەڕکەری لەلایەنگرانی عەلی هەڵبژارد و بەرەو مەزار بەرێکەوت. زۆرینەی ئەوان خەڵکانی رەبیعە بون.

مەعقەل کوڕی قەیس بەرەو مەداین بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەوێ، بیستی کەخەواریج لەوێ کۆچیان کردوە. ئەم کارە لای خەڵك دژوار بو. مەعقەل پێی وتن: ئەوان بۆیە لێرە ڕۆشتون تا ئێوە شوێنیان بکەون و ببنە چەندین دەستە و بڵاوەی لێبکەن و کاتێك روبەروی ئەوان دەبنەوە، هیلاك و شەکەت بن. هیچ زیانێك بەئێوە ناگات مەگەر ئەوەی ئەو زیانەیش بەوان بگات. مەعقەل بەدوای ئەواندا بەرێکەوت و ئەبو رەواغی هاورێ لەگەڵ سێسەد کەس وەك پێشەنگ رەوانە کرد. ئەبو رەواغ ڕۆشت تا لەمەزار روبەروی ئەوان بویەوە. لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد ئایا پێش گەیشتنی مەعقەل شەڕیان لەگەڵدا بکات یا نە. دەستەیەك وتیان: شەڕدەکەین و دەستەیەك وتیان: شەڕ ناکەین. ئەبو رەواغ وتی: مەعقەل فەرمانی بەمن داوە شەڕ

لەگەڵ ئەوان نەکەم. پێیان وت: باشترە لەمەستومرد نزیك ببیتەوە تا ئەو کاتەی مەعقەل دەگات. ئێواری بو. هەردو لای شەڕکەر شەویان کردە بەیانی و چاودێری یەکیان دەکرد. کاتێك خۆر هەڵات، خەواریج کەسێسەد پیاوی شەڕکەر بون، هێرشیان هێنا. هاوڕێکانی ئەبو رەواغ بۆ ماوەیەك شکەستیان خوارد و دواتر ئەبو رەواغ هاواری کرد: هێرشیان بکەنە سەر! هێرشیان بکەنەسەر!، ئەبو رەواغ لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی هێرشی برد و کاتێك روبەروی خەواریج بونەوە، تێکشکاو گەڕانەوە بەڵام کەسیان لێ نەکوژرا. دوبارە ئەبو رەواغ هاواری کرد: دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت! لەگەڵ ئێمە بگەڕێنەوە تا خۆمانیان لێ نزیك بکەینەوە و دورە پەرێز نەوەستین تا رێبەرەکەمان دەگات. زۆر گران و دژوارە تێکشکاو و سەرشۆڕ بۆ لای سوپاکەی خۆمان بگەڕێینەوە! یەکێك لەهاوەڵانی پێی وت: خوا شەرم لەراستی و دروستی ناکات. سوێند بەخوا ئێمەیان شکەستدا. ئەبو رەواغ وتی: خوا بکا لەناو ئێمەدا کەسانی وەك تۆ فراوان نەبن. ئێمە تا ئەو کاتەی لەگۆڕەپانی شەڕ دور نەکەوتوینەتەوە و پشتمان تێنەکردوە، شکەستمان نەخواردوە. هەرکاتێك رو لەدوژمن بکەین و لەنزیك ئەوانەوە بین، تێکشکاو نین. لەنزیك دوژمنەوە خۆڕاگرانە بێستن و ئەگەر هێرشیان کردە سەر ئێوە و نەتانتوانی خۆڕاگری بکەن، کەمێك پاشەکشێ بکەن و روبکەنە پێگەیەکی دیکە، ئەگەر شوێنتان نەکەوتن، خۆتان نزیك بکەنەوە و هێرشیان بکەنەسەر، چونکە کەمێکیتر سوپاکەمان پەیوەستمان دەبێت.

لەسەر ئەم بنەمایە، ئەم شێوازەیان گرتەبەر و هەر کاتێك خەواریج هێرشیان دەکرد، لەبەرابەر ئەوان پاشەکشێیان دەکرد و کاتێك خەواریج دەگەڕانەوە، ئەبو رەواغ و هاوڕێکانی هێرشیان دەبرد. لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بون تا نیمەڕۆ گەیشت. هەردولای شەڕکەر بۆ نوێژ وەستان. دواتر نوێژی عەسریان خوێند. لەولا، دێهاتیەکان و رێبوارەکان مەعقەلیان ئاگادار کردبویەوە کەخەواریج و سوپاکەی ئەو شەڕیان دەست پێکردوە. وتبویان، خەواریج پاشەکشێ بەسوپاکەی ئەو دەکەن و کاتێك دەگەڕێنەوە، سوپاکەی هێرشیان دەکەنە سەر. مەعقەل وتی: ئەگەر تێڕوانینی من بۆ ئەبو رەواغ راست بێت، ئەو هیچ کات تێکشکاو ناگەڕێتەوە. دواتر لەگەڵ حەوتسەد پیاوی شەڕکەر لەبەهێزەکان بەرێکەوت و موحریز کوڕی شەهابی تەمیمی کردە

فەرماندەیی خەڵکانی کەم توانا. کاتێك لەسەرەوە گەیشتنە لای ئەبو رەواغ، ئەبو رەواغ بەهاورێکانی خۆی وت: ئەوە تەپ و تۆزی هێزە پشتیوان و یارمەتیدەرەکان! با هێرش بکەینە سەر دوژمن تا هاورێکانمان گومان نەکەن خۆمان لەدوژمن دورەپەرێز گرتوە و ترساوین. ئەبو رەواغ و هێزەکەی پێشرەویان کرد تا لەروبەروی خەواریج جێگیر بون و مەعقەل و هاورێکانی پەیوەستیان بون. کاتێك خۆر بەرەو ئاوابون دەڕۆشت، مەستوەرد لەگەڵ هاورێکانی خۆی و ئەبو رەواغ لەگەڵ هاورێکانی خۆی بۆ نوێژ ریزیان بەست و مەعقەلیش لەگەڵ هاوەڵانی خۆی. ئەبو رەواغ بەمەعقەلی وتی: هێرشەکانی ئەوان مەترسیدارە، تۆ خۆت مەخەرە ناو ئەم شەڕەوە بەڵکو لەپشت سەرمان بمێنە تا پشتیوان و هۆکاری دڵگەرمی سوپاکە بیت. مەعقەل وتی: بۆچونەکەت راستە.

لەم کاتەدا کەئەو دوانە سەرقاڵی گفتوگۆ کردن بون، خەواریج هێرشیان کرد و زۆرینەی هاورێکانی مەعقەل شکەستیان خوارد و هەلاتن بەلام ئەو خۆڕاگرانە لەشوێنەکەی خۆی نەجولا. مەعقەل لەئەسپەکەی دابەزی و ئەبورەواغ و دوسەد پیاوی شەڕکەر هاورێیەتیان دەکرد. کاتێك مەستوەرد ئەوانی گەمارۆدا، بەشمشێر و ڕم روبەروی بونەوە. سوپاکەی مەعقەل کەمێك پاشەکشێیان کرد. دواتر مسکین کوڕی عامر کەپیاوێکی بوێر بو، هاواری کرد: بۆ کوێ هەڵدێن لەکاتێدا دەبینی سەرکردەکەتان لەئەسپ دابەزیوە و پیاوانە شەڕ دەکات! شەرم ناکەن؟ مسکێن گەڕایەوە و شەڕکەری زۆر لەگەڵ ئەو گەڕانەوە و مەعقەل کوڕی قەیس لەگەڵ هاورێکانی خۆی خەواریجیان کوشتار دەکرد. ئەوەندە شەڕیان کرد تا خەواریج بۆ ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە. زۆری نەخایاند موحریز کوڕی شەهاب و هاورێکانی گەیشتن. مەعقەل بەردەوام هێرشی دەکردە سەر باڵی چەپ وراست و بەهاورێکانی خۆی دەوت: لەشوێنەکەی خۆتان نەجوڵێن تا بەیانی دادێت و پێکەوە هێرشیان دەکەینە سەر.

لەم کاتەدا پیاوان روبەروی یەك وەستان. لەهەمان کات، هەواڵدەرێك لەخەواریج ڕۆیشتە لای ئەوان و ئاگاداری کردنەوە کەشەریك کوڕی ئەعوەری حارسی هاورێ لەگەڵ سێ هەزار شەڕکەر مەبەستی ئەوانی کردوە. مەستوەرد بەهاوەڵانی خۆی وت:

پێم باش نیە لەبەرابەر ئەم هەمو شەڕکەر خۆڕاگری بکەین. بەباشی دەزانم بگەڕێینەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوین چونکە خەڵکانی بەسرە تا سەرزەمینی کوفە بەدوای ئێمەدا نایێن و لەبەر ئەمە شەڕکردن لەگەڵ خەڵکانی کوفە بۆ ئێمە ئاسانتر دەبێت. دواتر بەوانی وت دابەزن تا ئەسپەکانیان ماوەیەك بحەسێنەوە.

ئەم کارەیان کرد و دواتر ڕۆشتنە ناو گوندەکە و ڕێنیشاندەرێکیان لەگەڵ خۆیاندا برد تا ڕێگەی گەڕانەوەیان نیشان بدات وخەواریج ڕێگەی گەڕانەوەیان گرتەبەر.

مەعقەل کاتێك سوپاکەی ئەوانی نەبینی، کەسێکی ڕەوانە کرد تا هەواڵی خەواریجی بۆ بێنێت. هەواڵیان بۆ هێنا کەمەستومرد و هاورێکانی لەوێ کۆچیان کردوە. مەعقەل ترسا فێڵێك لەئارادا بێت، لەوە دەترسا شەوانە هێرشی بکەنەسەر. لەبەر ئەمە دورئەندێشی کرد و تا بەرەبەیان پاسەوانیان لەخۆیان کرد. کاتێك خۆر هەڵات، کەسێکی ڕەوانە کرد و هەواڵی هێنا کەمەستومرد و هاورێکانی لەوێ دور کەوتونەتەوە. شەریك کوڕی ئەعوەر و هاورێکانی گەیشتن. ئەو کاتژمێرێك لەگەڵ مەعقەل گفتوگۆی کرد و لەبارودۆخ ئاگادار بویەوە. شەریك داواری لەهاوەڵانی خۆی کرد هاورێیەتی مەعقەل بکەن بەڵام ڕازی نەبون و شەریك داوای لێبوردنی لەمەعقەل کرد. ئەو هاورێی مەعقەل بو ولایەنگیری کردن لەعەلی پەیوەندیەکی بەهێزی لەنێوان ئەو دوانەدا دروست کردبو. مەعقەل داوای لەئەبو ڕەواغ کرد لایەنگری و هاورێیەتی بکات. ئەبورەواغ وتی: بەژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵ مندان، شەڕکەرەکانم زیاد بکە تا لەکاتی شەڕ لەگەڵ خەواریج بەتواناتربم. مەعقەل شەشسەد سواری کردە هاورێی. سوپاکەی ئەبورەواغ بەرێکەوت و غاریاندا تا لەجەرجەرایا بەخەواریج گەیشتن و بینیان لەوێ دابەزیون. ئەبو ڕەواغ و سوپاکەی لەکاتی ئاوابونی خۆر دابەزین. کاتێك خەواریج ئەوانیان بینی، وتیان: شەڕکردن لەگەڵ ئەمان ئاسانتر لەگەڵ ئەو کەسانەیە دوای ئەمان دەگەن. مەستومرد و هاورێکانی سەرسەختانە هێرشیان کردە سەر ئەبورەواغ و سوپاکەی. هاورێکانی ئەبو ڕەواغ شکەستیان خوارد و هەڵاتن. ئەبو ڕەواغ لەگەڵ سەد سوار مایەوە و شەڕ لەگەڵ ئەوان درێژەی کێشا. بەردەوام دەیوت:

| | |
|---|---|
| ان الفتی کل الفتی من لم یهل | اذا الجبان حاد عن وقع الاسل |
| قد علمت انی اذا الباس نزل | اروع یوم الهیج مقدام بطل |

یانی: جوامێری راست و راستەقینە ئەو کەسەیە ترسی لەدڵدا نەبێت و ئەمە لەکاتێکدایە شەڕکەرە ترسەنۆکەکان لەترسی ڕم پشت دەکەنە گۆڕەپان و هەڵدێن. هاورێکەی من بەباشی دەزانێت کاتێك مەترسی شەڕ داباریێت، پاڵەوانێکی دوژمن کوژم و هیچ کات ناترسم و بەردەوام بۆ پێشەوە دەڕۆم.

دواتر هاورێکانی لەسوچ و قوژبنەکانەوە گەڕانەوە و شەڕێکی راستەقینەیان دەست پێکرد. کاتێك مەستومرد ئەمەی بینی، زانی ئەگەر مەعقەل و هاورێکانی بگەن، خەواریج هەمویان لەناو دەچن. لەگەڵ هاورێکانی بەرێکەوتن و لەدیجلە تێپەڕین و لەسەرزەمینی بەهرسیر مانەوە. ئەبو رەواغ شوێنیان کەوت وئەوان لەسابات دابەزین. کاتێك ئەم کارەی کرد، مەستومرد بەهاورێکانی خۆی وت، ئەمانە دەستە سەرکێشەکەی سوپای مەعقەل و شەڕکەرە بەهێزەکانی ئەون. ئەگەر دەمزانی یەك کاتژمێر زوتر لەو دەگەم، پێشی دەکەوتم و شەڕم لەگەڵ دەکرد. دواتر فەرمانی دا سەبارەت بەمەعقەل پرسیار بکەن. لەرێبوارەکانیان پرسی و ئەوان وتیان مەعقەل و هاورێکانیان لەدیلمایا لەسێ فەرسەخی دابەزیون. کاتێك مەستومرد لەمە ئاگادار بویەوە، لەگەڵ هاورێکانی سواربون و بەرێکەوتن تا گەیشتنە پردی سابات. ئەمە پردی روباری شا بو. ئەو لەلای کوفە بو وئەبو رەواغ لەلای مەداین. کاتێك ئەبو رەواغ بینی سوار بون، هاورێکانی خۆی کۆکردەوە و بۆ پێشەوە ڕۆیشت و لەشوێنێك لەبیابان لەنێوان مەداین و سابات مایەوە تا شەڕەکە لەوێ روبدات. لەوێ مایەوە و چاوەڕوانی ئەوانی کرد. کاتێك مەستومرد لەپردەکە تێپەڕی، بەرەو دیلمایا بەرەو لای مەعقەل بەرێکەوت تا شەوانە هێرشی بکاتە سەر. گەیشتە شوێنکەی مەعقەل و لەم کاتەدا هاورێکانی مەعقەل بڵاو ببونەوە و ئەو دەیویست لەوێ بڕوات و دەستەیەك لەهاورێکانی پێشتر رەوانە ببون. کاتێك مەعقەل ئەوانی بینی، ئاڵاکەی خۆی هەڵکرد و هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا! لێرە کۆببنەوە. نزیکەی دوسەد پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆبونەوە. خەواریج هێرشیان کرد و ئەوان ئەژنۆ لەسەر زەوی پێشوازیان لێکردن. مەعقەل و هاورێکانی نەیانتوانی بەسەر خەواریجدا زاڵ ببن. لەبەر ئەمە رویان لەئەسپەکانیان کرد بەڵام خەواریج رێگەیان لێگرتن و جڵەوی ئەسپەکانیان بڕی و ئەسپەکان بڵاوەیان لێکرد. دواتر هێرشی کردە سەر شەڕکەرە پرژ و بڵاوەکانی

مەعقەل و لەنێوان ئەوان جیایی دروست کرد. ئەوسا روی کردە مەعقەل و هاورێکانی کەئەژنۆ لەسەر زەوی دانیشتبون بەڵام مەعقەل و هاورێکانی لەشوێنی خۆیان نەجوڵان. دوبارە هێرشیان کرد بەڵام نەیانتوانی بەسەر ئەواندا زاڵبن. مەستومرد بەهاورێکانی خۆی وت: نیوەتان دابەزن و نیوەتان لەسەر ئەسپەکان بمێننەوە. ئەم کارەیان کرد و کار بۆ مەعقەل و هاورێکانی دژوار بو و ئەوەندەی نەمابو هەمویان لەناو بچن.

لەم کاتەدا ئەبو رەواغ و هاورێکانی گەیشتن. هۆکاری گەڕانەوە ئەوەبو ئەبو رەواغ لەشوێنەکەی خۆی مایەوە و چاوەڕوانی ئەوانی دەکرد. کاتێك درەنگیان کرد، کەسێکی رەوانە کرد تا هەواڵی خەواریجی بۆ بێنێت. ئەوان پردەکەیان بەروخاو بینی و شادمان بون و گومانی ئەوەیان کرد خەواریج لەترسی ئەوان پردەکەیان روخاندوە. بۆ لای ئەبو رەواغ گەڕانەوە و ئاگاداریان کردەوە کەخەواریجیان نەبینیوە چونکە لەترسی ئەوان پردەکەیان روخاندوە. ئەبو رەواغ وتی: سوێند بەگیانی خۆم ئەم کارەیان بەفێڵ کردوە و گومانم نیە پێش من خۆیان بەمەعقەل گەیاندوە چونکە هەمو شەڕکەرە ئازاکانیان لەگەڵ من بینیوە و پردەکەیان بۆیە روخاندوە تا ئێوە بەخۆیانەوە سەرقاڵ بکەن. خێراکەن، خێراکەن و ئەوان بدۆزنەوە.

دواتر فەرمانی بەدێهاتیەکاندا و پردەکەیان هەڵبەستەوە، لەپردەکە تێپەڕین و شوێن خەواریج کەوتن. لەم کاتەدا یەکەم دەستەی هەڵاتوانی بینی. هاواری کرد: بۆ لای من وەرن! بۆلای من وەرن! گەڕانەوە و هەواڵی گۆڕەپانی شەڕیان پێدا و وتیان مەعقەلیان بەجێهێشتوە وئەو پیاوانە شەڕ دەکات و گومان دەکەین ئێستا لەسەر دەستی خەواریج کوژرا بێت. ئەبو رەواغ بەخێرایی غاریدا و هەڵاتوان هاورێیەتیان کرد. سوپاکەی ئەبو رەواغ گەیشت و بینی ئاڵاکەی مەعقەل هەڵکراوە. هاورێکانی مەعقەل پیاوانە شەڕیان دەکرد. ئەبو رەواغ و هاورێکانی هێرشیان کردە سەر خەواریج و بۆ شوێنێکی نەزۆر دور، پاشەکشێیان پێکردن. ئەبو رەواغ خۆی گەیاندە مەعقەل و بینی پێشڕەوە و بۆ شەڕ سوپاکەی هان دەدات. ئەوان بەهەمو هێزیانەوە هێرشیان کردە سەر خەواریج. مەستومرد و هاورێکانی لەئەسپەکان دابەزین و مەعقەل و هاورێکانی بەهەمان شێوە و دواتر تەواوی رۆژیان بەشەڕە شمشێر بەسەر

برد.

دواتر مەستومرد داواری شەڕی دەستەویەخەی لەمەعقەل کرد. هاوڕێکانی ویستیان ڕێگەی ئەو کارەی لێ بگرن بەلاّم مەعقەل رازی نەبو و ئامادەیی خۆی نیشاندا. مەعقەل شمشێری هەلگرت و مەستومرد ڕم. هاوڕێکانی مەعقەل وتیان: ڕمەکەت هەلبگرە. ئەو گوێی لەئامۆژگاری ئەوان نەگرت و هێرشی کردە سەر مەستومرد. مەستومرد بەشێوەیەك لێیدا کەڕمەکە لەپشتیەوە هاتەدەر. مەعقەل بەو حالەوە خۆی گەیاندە مەستومرد و بەشمشێر لەتەوقی سەریدا و مێشکی رژایە سەر زەوی. مەستومرد کەوت و مرد و مەعقەلیش بەدوای ئەو.

مەعقەل وتبوی: ئەگەر مردم، عەمرۆ کوڕی موحریز کوڕی شەهابی تەمیمی فەرماندەی ئێوە بێت. کاتێك کوژرا، عەمرۆ ئالاکەی هەلگرت و هاوڕێ لەگەلّ سوپاکەی هێرشی کردە سەر خەواریج و دەستی بەکوشتاری ئەوان کرد. هەمویانی کوشت بەشێوەیەك پێنج یا شەش کەسیان بەزیندوی رزگاریان بو.

کوڕی کەلبی دەلێت: مەستومرد لەتەمیم و لەبەنی ریاح بو. ئەو ئەم هۆنراوەی جەریر وەك بەلگەیەك بۆ قسەکەی خۆی دەهێنێتەوە:

و منا فتی الفتیان و الجود معقل          و منا الذی لاقی بدجلة مهقلا

یانی: لەناو ئێمە جوامێری جوامێرەکان و یەکەمی بەخشەرەکان مەعقەلە و ئەو کەسە لەئێمەیە لەکدناری دیجلە روبەروی مەعقەل بویەوە.

## گەڕانەوەی عەبدولرەحمان بۆ پارێزگاری سیستان

لەم سالەدا عەبداللە کوڕی عامر، عەبدولرەحمان کوڕی سەمورەی وەك فەرمانداری سیستان دەستنیشان کرد. عەبدولرەحمان ڕۆشتە ئەوێ وسەرکردەی پاسەوانەکانی عەباد کوڕی حوصەینی حەبەتی بو و لەگەورەکان عوبەیداللە کوڕی مەعمەر و کەسانی دیکە هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەو شەڕی ئەو شارانەی دەکرد کەخەلکەکەی لەدین هەلگەڕابونەوە و دەستی بەسەردا دەگرتن. سەرئەنجام گەیشتە کابول و بۆ ماوەی یەك مانگ گەمارۆیدا و کەشکەنجیری (بەردهاوێژ) دانا و دیواری شار کەلێنێکی گەورەی تێکەوت. عەباد کوڕی حوصەین شەوێك مایەوە و شەڕی لەگەلّ بتپەرستەکان ئەزمون

کرد. ئەوان نەیانتوانی کەلێنی دیوارەکە بگرن و لەبەر ئەمە هاتنەدەر و لەبەرابەر موسوڵمانان خۆڕاگریان کرد. موسوڵمانان شکەستیان بەوان هێنا و بەزۆر ڕۆشتنە ناو شارەکە. دواتر بەرەو (بەست) بەرێکەوت و بەزۆر دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. ڕۆشتە زەران و خەڵکەکەی هەلاتن و بەسەر ئەوشارەیشدا زاڵبو. بەرەو (خوشك) بەرێکەوت و خەڵکەکەی بەئاشتی لەگەڵیدا ڕێککەوتن. ڕەوانەی (رەخج) بو و خەڵکەکەی شەڕیان کرد و دەستی بەسەر ئەو شارەیشدا گرت. دواتر ڕۆشتە زابولستان کەهەمان غەزنە و دەوروبەریەتی. خەڵکەکەی خۆڕاگریان کرد. ئەوان پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو. دەستی بەسەر ئەو ناوچانەیشدا گرت و بۆ کابول گەڕایەوە و بینی دوبارە خەڵکەکەی پەیمانی خۆیان شکاندوە.

## شەڕی سند

عەبداللە کوڕی عامر، عەبداللە کوڕی سواری عەبدی بۆ سنورەکانی هند دەست نیشان کرد.

دەستەیەك دەڵێن: معاویە ئەوی دەست نیشان کرد. ئەو لەگەڵ (قیقان) شەڕی کرد و تالأنی دەست کەوت و بۆ لای معاویە گەڕایەوە و ئەسپی قیقانی وەك خەلأت بۆ برد. گەڕایەوە و شەڕی لەگەڵ قیقانیەکان کرد. تورکەکان هاوکاری قیقانیەکانیان کرد و توانیان ئەو بکوژن. شاعیرێك لەمبارەوە دەڵێت:

و ابن سوار علی عدانه        موقد النار و قتال الشغب

کوڕی سوار لەرۆژگاری خۆی، داگیرسێنەری ئاگر و بکوژی خراپەکاران بو.

## فەرمانداری عەبداللە کوڕی خازم لەخوراسان

دەڵێن: لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی عامر، قەیس کوڕی هەیسەمی قەیسی سولەمی لەفەرمانداری خوراسان لابرد و عەبداللە کوڕی خازمی لەجێگاکەی دانا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبو کەقەیس لەرەوانە کردنی باج و دیاری (لەرێگەی تالأن کردنی خەڵکەوە) لاوازی لەخۆی نیشان دەدا. عەبداللە کوڕی خازم بە عەبداللە کوڕی عامری وت: من بکەرە فەرمانداری خوراسان تا کاروبارەکان سامان بدەم. ئەو فەرمانی

ئەم کارەی دا. ئەم هەواڵە بەقەیس گەیشت و لە کوڕی خازم و فێڵ و فریوی ئەو ترسا. خوراسانی بەجێهێشت و ملی ڕێگای گرتەبەر. تورمیی کوڕی عامر زیادی کرد لەبەر ئەوەی ئەو سنورەی بە کەم زانی. ئەوی خستە زیندان و ئەشکەنجەی کرد و پیاوێك لەیەشکری کردە فەرمانداری خوراسان. دەستەیەك دەڵێن: سەرەتا ئەسلەم کوڕی زورعەی کەلابی دانا و دواتر کوڕی خازم.

سەبارەت بەهۆکاری لەسەر کار لابردنی ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. یەکیان ئەوەیە کە کوڕی خازم بە کوڕی عامری وت: تۆ قەیست کردۆتە فەرمانداری خوراسان لەکاتێکدا پیاوێکی ناتەوان و لاوازە و دەترسم ئەگەر شەڕێك روبدات، شکەست بخوات و خوراسانمان لەدەست بڕوات و خاڵەکاتی تۆ ریسوا ببن. مەبەستەکەی خەڵکی قەیسی عەیلان بو. کوڕی عامر وتی: دەبێت چی بکەین؟ وتی: فەرمانێك بدە ئەگەر ئەو پشتی کردە دوژمنێك من جێگەکەی بگرمەوە. کوڕی عامر ئەم فەرمانەی دەرکرد.

لەم کاتەدا دەستەیەك لەخەڵکی تەخارستان شۆڕشیان کرد. قەیس راوێژی لەگەڵ کرد تا بۆچونی وەربگرێت. کوڕی خازم وتی بۆچونم وایە بگەڕێیتەوە تا خەڵکەکەت لەدەورت کۆببونەوە. کاتێك ماوەیەکیان لەرێگا بڕی، کوڕی خازم فەرمانەکەی دەرهێنا و کاروباری خەڵکی گرتە دەست. روبەروی دوژمن بویەوە و ئەوانی تێکشکاند. ئەم هەواڵە بەکوفە و بەسرە و شام گەیشت و خەڵکانی قەیس تورە بون و وتیان کە کوڕی خازم فێڵی لە قەیس و کوڕی عامر کردوە. گلەییان بردە لای معاویە. معاویە بانگی کرد و کوڕی خازم سەبارەت بەو قسانەی، داوای لێخۆشبونی کرد. معاویە وتی: بەیانی لەناو خەڵکدا هەستە و داوای لێخۆش بون بکە. ئەو بۆ لای هاورێکانی خۆی گەڕایەوە و وتی: فەرمانیان پێداوم، وتارێك پێشکەش بکەم بەڵام وتاردەرێکی باش نیم. ئێوە لەدەوری تەختی وتاردان دابنیشن و کاتێك قسە دەکەم قسەکانم پشت راست بکەنەوە.
بەیانی وتارەکەی دەست پێکرد. سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: تەنیا دو کەس وتار پێشکەش بەخەڵك دکەن: رێبەرێك کەهیچ رێگە چارەیەکی نیە و یا نەزانێك کەزۆربڵەیی ئارەزویەتی و من هیچ کام لەم دوانە نیم. ئەو کەسەی من دەناسێت دەزانێت، من دەرفەتەکان دەناسم و دەیانقۆزمەوە، لەشوێنی لەناوچون خۆم نزیك

ناکەمەوە، بەچاکە کۆتایی بەشەڕ دێنم و سامانەکان بەیەك ئەندازە بەسەر خەڵکان دابەش دەکەم. هەر کەسێك من بەم تایبەتمەندیانە دەناسێت، سوێندی دەدەم تا وتەکانی من پشت ڕاست بکاتەوە. هاوڕێکانی وتیان: ڕاستت وت. دوبارە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ لەو کەسانەیت کەسوێند درایت، ئەوەی دەیزانی بیڵێ. معاویە وتی: ڕاستت وت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم، فەرمانداری مەدینە، لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. فەرمانداری مەککە خالید کوڕی عاص کوڕی هشام، فەرمانداری کوفە موغەیرە کوڕی شەعبە و فەرمانداری بەسرە عەبدالله کوڕی عامر بو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی سەلام، لەهاوەڵە بەناوبانگەکانی پێغەمبەر، کۆچی دوایی کرد. ئەو لەزاناکانی (ئەهلی کتێب) بو و پێغەمبەر مژدەی بەهەشتی پێبەخشی.

ڕوداوەکانی ساڵی چل و چوارەمی کۆچی

(٦٤٤ زایینی)

لەم ساڵەدا موسوڵمانان لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی ڕۆمیەکان و زستانیان لەوێ بەسەر برد. بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا ڕوی کردە شەڕی دەریایی.

## لابردنی عەبدالله کوڕی عامر لەفەرمانداری بەسرە

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی عامر وەك فەرمانداری بەسرە لەسەر کارەکەی لابرا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کوڕی عامر پیاوێکی خۆڕاگر، فرمزان، ڕێزدار و نەرم و نیان بو و گرنگی بەنەزانەکان و ئاژاوە گێڕەکان نەدەدا. بەسرە لەرۆژگاری فەرمانداری ئەو بەرەو نائارامی وپشێوی ڕۆیشت. ئەو گلەیی بردە لای زیاد کوڕی نوبیە و داوای ڕێگە چاری لێکرد. زیاد وتی: شمشێرەکەت لەکالآن دەربێنە. کوڕی عامر وتی: نامەوێت بە لەناوبردنی خۆم، ئەوان لەفێرۆیی ڕزگار بکەم. دواتر کوڕی عامر دەستەیەکی وەك

وەفدی نوێنەرایەتی خۆی بۆ لای معاویە رەوانە کرد و ئەوان لای معاویە چاویان بەوەفدی خەڵکانی کوفە کەوت. کوڕی کەوا لەناویاندا بو کەناوەکەی عەبداللە کوڕی ئەبی ئەوفای یەشکریە. معاویە لەوان سەبارەت بەعێراقیەکان بەتایبەت خەڵکانی بەسرە پرسیاری کرد. کوڕی کەوا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەزانەکان و ئاژاوەگێران بەسرەیان داگیر کردەوە و فەرمانڕەوایی کردن بەسەر ئەوان لاواز بوە. ئەو کوڕی عامری بەسست و لاواز لەقەڵەمدا. معاویە وتی: لای خەڵکانی بەسرەیش ئەم قسانە دەکەیت؟

کاتێك وەفدی خەڵکانی بەسرە گەڕانەوە، ئەویان لەپێشهاتەکان ئاگادار کردەوە. کوڕی عامر تورە بو و وتی: چ کەسێك لەعێراقیەکان زیاتر لەهەموان دوژمنی کوڕی کەوا ە؟ وتیان: عەبداللە کوڕی ئەبی شێخی یەشکری. کوڕی عامر ئەوی کردە فەرمانداری خوراسان. کاتێك کوڕی کەوا لەم هەواڵە ئاگادار بویەوە، وتی: کوڕی (دەجاجە) یانی کوڕی عامر سەبارەت بەمن کەم دەزانێت. گومان دەکات بەم کارەی ئازاری من دەدات. زۆر حەز دەکەم هەر یەشکریەك من بەدوژمنی خۆی دەزانێت، لەلایەن کوڕی عامرەوە فەرمانداری پێ ببەخشرێت.

دەستەیەك دەڵێن: کوڕی عامر توفەیل کوڕی عەوف یەشکری وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد.

کاتێك معاویە لەچارەنوسی بەسرە ئاگادار بویەوە، بڕیاریدا کوڕی عامر لەسەر کارەکەی لاببات. لەبەر ئەمە کەسێك بۆ لای کوڕی عامر رەوانە کرد و داوای لێکرد سەردانی بکات. کوڕی عامر ڕۆشتە لای معاویە و معاویە ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە، لەکاتی ماڵئاواییدا پێی وت: سێ شتم لە تۆ دەوێت، بڵێ کە بەمنی دەبەخشی. کوڕی عامر وتی: ئەوانم بەتۆ بەخشی، من کوڕی دایکی حەکیمم. معاویە وتی: کارەکەم بۆ خۆم بگەڕێنەرەوە و تورە مەبە. کوڕی عامر وتی: رازیم. معاویە وتی: ماڵەکانی خۆت لەمەککە بەمن ببەخشە. کوڕی عامر وتی: بەخشیم. معاویە وتی: سامانی خۆت لەعەرەفە بە من ببەخشە. کوڕی عامر وتی: بەخشیم. معاویە وتی: پەیوەندی خزمایەتیت بەهێز کرد. کوڕی عامر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سێ کارم لەتۆ دەوێت، بڵێ بەتۆی دەبەخشم. معاویە وتی: بەخشیم، من کوڕی هندم.

کوڕی عامر وتی: سامانەکانم لەعەرەفە بۆ بگەڕێنەرەوە. معاویە وتی: رازیم. کوڕی عامر وتی: لێکۆڵینەوە لەگەڵ هیچ کام لەکارگوزاران و هیچ کام لەکارمکانی من مەکە. معاویە وتی: نایکەم. کوڕی عامر وتی: کچەکەت هند بکەرە هاوسەری من. معاویە وتی: کچەکەم دەکەمە هاوسەری تۆ.

دەستەیەك دەڵێن: معاویە پێی وت: یەکێك لەم دو کارە هەڵبژێرە: یا لێکۆڵینەوە لەکارەکانت دەکەم و لێپرسینەوە لەگەڵ خۆت، یا تۆ لەسەر کار لادەبەم و هەرچیت بردوە و خواردوتە (تالآنت کردوە) بەتۆی دەبەخشم. کوڕی عامر لەسەر کار لابرانی هەڵبژارد و خوازیاری ئەوەبو لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت. معاویە ئەوی لەسەر کار لابرد و حارس کوڕی عەبداللەی ئەزدی لەجێگاکەی دانیشاند.

## پەیوەست کردنی (گەڕاندنەوەی) زیاد کوڕی ئوبیە بەباوکی معاویە

لەم ساڵەدا معاویە، زیاد کوڕی سومەییەی پەیوەستی باوکی خۆی کرد. ئەم هەواڵەیان بەمشێوەیە گێڕاوەتەوە کەکاتێك زیاد ڕۆشتە لای معاویە، پیاوێك لەخەڵکی عەبدقەیس هاوڕێیەتی دەکرد. بەزیادی وت: من حەقێکم لای کوڕی عامر هەیە، ئەگەر فەرمانم پێ بدەیت، دەڕۆمە لای. زیاد وتی: لەسەر ئەو بنەمایی هەر گفتوگۆیەك لەنێوان ئێوەدا کرا، منی لێ ئاگادار بکەیتەوە. پیاو وتی: ئەو کارە دەکەم. زیاد فەرمانی پێدا. پیاو ڕۆشتە لای کوڕی عامر.

کوڕی عامر وتی: بەبە! دەسخۆش! کوڕی سومەییە کارەکانی من بەقێزەون لەقەڵەم دەدات و سەرکۆنەی کارگوزارانم دەکات. بڕیارم داوە چەندین کەس لەقوڕەیش بێنم تا هەمویان سوێند بخۆن کەئەبو سوفیان هیچ کات سومەییەی نەبینیوە.

کاتێك گەڕایەوە، زیاد پرسیاری لێکرد، بەڵام ئەو پیاوە ئەوی لەگفتوگۆکە ئاگادار نەکردوە. زیاد پێداگری کرد و پیاو لەگفتوگۆکە ئاگاداری کردەوە. زیاد معاویەیی لەم گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە. معاویە بەدەرگاوانەکەی خۆی وت: کاتێك کوڕی عامر هات، لەدورترین درگاوە لەروخساری چوارپێکەی بدە. دەرگاوان ئەو کارەی کرد. کوڕی عامر ڕۆشتە لای یەزید کوڕی معاویە و گلەیی دەست پێکرد. یەزید ئەوی بردە لای معاویە. کاتێك معاویە سەیری کرد، هەستا و ژورەکەی بەجێهێشت. یەزید بەکوڕی عامری وت:

دانیشە چونکە گومان دەکرێت دانیشتنی تۆ لەکۆڕەکەی ئەو زۆر بخایەنێت. کاتێك ئەم دوانە لەسەر گفتوگۆکەیان بەردەوام بون، معاویە هاتە ناو و بەردەوام دەیوت:

لنا سباق و لکم سباق　　　　قد علمت ذلکم الرفاق

یانی: ئێمە پێش کەوتنێکمان هەیە و ئێوە پێش کەوتنێك. هاورێکانی من ئەمەیان بەباشی زانیوە.

دواتر دانیشت و وتی: ئەی کوڕی عامر، ئایا تۆ سەبارەت بە زیاد فلان قسە و فیسارە قسەت کردوە؟ سوێند بەخوا عەرەبەکان دەزانن لەرۆژگاری جاهلی بەرێزترینی ئەوان بوم و ئیسلام بەرێزی منی زیاتر کرد. من لەبەر ئەوە روم نەکردە زیاد تا کەم و کوڕی خۆمی پێ دابپۆشم و لەبەر ئەوە نەبو بەبونی ئەو رسوایی خۆم بۆ رێزداری بگۆڕم. من حەقێکم بۆ ئەو بەرەوا زانیوە و پێم بەخشیوە. کوڕی عامر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو کارە دەکەین کەزیاد پێی خۆشە. معاویە وتی: بەم پێیە ئەو کارە دەکەین کەتۆ پێت خۆشە. کوڕی عامر ڕۆشتە لای زیاد و ئەوی رازی کرد.

کاتێك زیاد هاتە کوفە، وتی: بۆ کارێك هاتومە ئێرە و ئەو کارەم بۆ ئێوە دەوێت. وتیان: چیت دەوێت؟ وتیان: نەژادی من بۆ معاویە بگەڕێنەوە. وتیان: بەلام بەشایەتی درۆ، هەرگیز. ئەو ڕۆشتە بەسرە و پیاوێکی لێ بو و لەمبارەوە شایەتی بۆ دا.

ئەمە ئەو گێڕانەوەیە ئەبو جەعفەری تەبەری سەبارەت بەپەیوەست بونی نەژادی زیاد بەمعاویە ئاماژەی پێداوە. ئەو ئاماژەی بەراستی و دروستی ئەم داستانە نەداوە تەنیا ئاماژەی بەگێڕانەوەیەك داوە کەدوای پەیوەست بونی نەژادی زیاد بەمعاویە رویدا. من هۆکاری ئەم کارە و چۆنیەتیەکەی باس دەکەم چونکە لەگێڕانەوە بەناو بانگەکانی ناو ئیسلامە کەنابێت پشت گوێ بخرێت.

سەرەتایی سەربوردەکە بەمشێوە بو کەسومەییە دایکی زیاد کۆیلەی فەرمانداری روباری زیندو لەکەسکەر بو. فەرماندار نەخۆش کەوت و حارس کوڕی کەلدەی سەقەفی پزیشکی بانگ کرد. ئەو فەرماندارەکەی دەرمان کرد و چاك بویەوە. فەرماندار سومەییەی پێ بەخشی. ئەم ژنە ئەبوبەکرەی بۆ هێنایە دونیا کەناوەکەی نوفەیع بو. پزیشك ئەم کوڕەی خۆش نەدەویست. کاتێك پێغەمبەر گەمارۆی خستە سەر تایف،

ئەبوبەکرە ڕۆشت لای پێغەمبەر و حارس بەنافعی وت: تۆ کوڕی منیت. پزیشك سومەییەیی کردبوە هاوسەری یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی عوبەید. ئەم عوبەیدە خەڵکی رۆم بو و سومەییە زیادی بۆ هێنایە دونیا.

جارێك لەرۆژگاری جاهلی، ئەبوسوفیان کوڕی حەرب ڕۆشتە تایف و لای عەرەق فرۆشێك بەناوی باوکی مریەمی سلولی دابەزی. دواتر باوکی مریەم باوەڕی بەئیسلام هێنا و بوبەهاوڕێی پێغەمبەر. ئەبوسوفیان بەئەبو مریەمی وت: حەزم لەژنێکە، لەش فرۆشێك بۆ من ئامادە بکە. باوکی مریەم وتی: سومەییەت دەوێت؟ ئەبوسوفیان وتی: بیهێنە هەرچەندە مەمکی زۆر گەورە و ورگی زلە. باوکی مریەم سومەییەی هێنا و ئەبوسوفیان لەگەڵی خەوت و ژن بەزیاد سکی پڕبو و لەساڵی یەکەمی کۆچی ٦٦٢ زایینی ئەوی هێنایە دنیا. کاتێك گەشەی کرد و گەورە بو، ئەبوموسای ئەشعەری لەکاتی فەرمانداری بەسرە، پەیمانی ئازادی لەگەڵ نوسی. دواتر عومەر کوڕی خەتاب کارێکی بەزیاد سپارد و بەباشی ئەنجامیدا و پێگەکەی بەرز بویەوە. کاتێك گەڕایەوە ڕۆشتە لای عومەر و موهاجیر وئەنسار لای ئەو دانیشتبون. زیاد وتارێکی جوانی پێشکەش کرد کەهاوشێوەکەیان نەبیستبو. عەمرۆعاص وتی: دەسخۆش بۆ ئەم کوڕە کەئەگەر لەقوڕەیش دەبو، عەرەبەکانی بەداردەستەکەی دور دەخستەوە! ئەبو سوفیان لەوێ بو و وتی: من باوکی دەناسم و باش دەزانم چ کەسێك سکی دایکی پڕ کردوە. عەلی وتی: ئەی ئەبوسوفیان بێدەنگ بە چونکە دەزانی ئەگەر عومەر ئەم قسەیە ببیستێت، هێرش دەکاتە سەرت.

کاتێك عەلی بەفەرمانڕەوایی گەیشت، زیادی وەك فەرمانداری فارس دەستنیشان کرد. زیاد ئەو کارەی بەباشی گرتە ئەستۆ و و لەپارێزگاری کردنی قەلاکان کەمتەرخەمی نەکرد. ئەم هەواڵە بەمعاویە گەیشت و توڕە بو. نامەی بۆ زیاد نوسی و ئەوی ترساند و بەنهێنی ئاگاداری کردەوە کەئەبوسوفیان باوکیەتی. کاتێك زیاد نامەکەی معاویەی خوێندەوە، لەناو خەڵکدا وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: سەرم سوڕماوە لەکوڕی ئەو ژنە جەرگ خۆرە و سەرکردەی دوروە خراپەکاران کەبەردەوام پەیك و پەیام بۆ من رەوانە دەکات و دەمترسێنێت و لەنێوان من و ئەو دو کوڕە مامی پێغەمبەر لەموهاجیر و ئەنسارن. سوێند بەخوا ئەگەر بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو

فەرمانم پێبدرێت، من وەك كەسێكی توند و تیژ و ترسێنەر بەشمشێرەوە دەبینێت.

ئەم هەواڵە بەعەلی گەیشت. نامەی بۆ زیاد نوسی: ئەو كاتەی تۆم كردە فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە، دەمزانی بۆ ئەو كارە شیاویت، پێشتر ئەبوسوفیان قسەیەكی ناڕاست و درۆی هێناوەتە سەرزمان كە بەپێی ئەو وتەیە نەدەتوانرێت میرات لەكەسێك ببەیت و نەژادی خۆت بەرز بكەیتەوە. معاویە لەروبەرو و پشتەسەر و چەپ و راست دەڕواتە لای خەڵك. كەواتە وشیار بە و دوبارە وشیار بە. سڵاو و ماڵئاوا.

كاتێك عەلی كوژرا و زیاد لەگەڵ معاویە ئاشتی كرد بەهەمان شێوە كەئاماژەمان پێدا، زیاد لەگەڵ مەصقەلە كوڕی هوبەیرەی شەیبانی رێككەوت و بەڵێنی دا بیست هەزار درەمی پێ بدات تا بەمعاویە بڵێت: زیاد سەرزەمینی فارسی لەوشكی و دەریاوە خواردوە. ئێستا لەسەر بنەمایی دانی دو هەزار هەزار (دو ملیۆن درەم) لەگەڵ تۆ ئاشتی كردوە، سوێند بەخوا ئەوەی دەوترێت، راست و دروستە. كاتێك بەتۆ بڵێت: چی دەوترێت؟ بڵێ: ئەو كوڕی ئەبو سوفیانە. مەصقەلە ئەم كارەی كرد و معاویە بڕیاریدا زیاد بەرەو لای خۆی رابكێشێت. ئەو لەرێگەی پەیوەست كردنی زیادەوە، هاورێیەتی و دۆستایەتی ئەوی پیس و گلاو كرد. ئەم دوانە لەسەر ئەم كارە رێككەوتن. خەڵكی كۆكردەوە و كەسێكی هێنا شایەتی بۆ زیاد بدات. یەكێك لەوان باوكی مریەمی سەلولی عەرەق فرۆش بو. باوكی مریەم وتی: ئەبۆسوفیان جارێك هاتە لای من و داوای ژنێكی لەش فرۆشی لێكردم. وتم: ئێستا تەنیا سومەییەم لەبەردەستایە. ئەبوسوفیان وتی: بیهێنە هەرچەندە زۆر ناشیرین و گلاو و شڵ و بڵە. سومەییەم هێنا و ئەبو سوفیان بەتەنیا لەگەڵی ڕۆشتە ژوور و ماوەیەكی نەخایاند سومەییە هاتەدەر و ... زیاد وتی: بێدەنگ بە ئەی باوكی مریەم، داوامان لێكردی شایەتی بدەیت نەك جوێن بارانمان بكەیت.

لەمەدوا، معاویە زیادی پەیوەستی بنەماڵەكەی خۆی كرد. پەیوەست كردنی زیاد یەكەم كار بۆ پێشێل كردنی ئاشكرای فەرمانە دینیەكان بو چونكە پێغەمبەر فەرموبوی منداڵ هی سەر جێگەیە و پیاوی خراپە كار و ژنی لەش فرۆش دەبێت بەردباران بكرێن.

زیاد نامەی بۆ عایشە نوسی: لەزیاد کوڕی ئەبو سوفیان بۆ دایکی باوەڕداران. مەبەستەکەی ئەوە بو عایشە لەوەڵامدا بنوسێت: لەدایکی باوەڕداران بۆ زیاد کوڕی ئەبو سوفیان. زیاد دەیویست بەم کارە بەڵگەیەك لای خەڵك دروست بکات کەکوڕی ئەبوسوفیانم. عایشە نوسی: لەدایکی باوەڕداران بۆ کوڕەکەی زیاد. ئەم کارە بۆ موسوڵمانان بەگشتی و بۆ ئومەوییەکان دژوار بو و چەندین داستانی لەبارەوە دروست کرا کەئاماژەدان پێیان درێژە دەکێشێت. لەبەر ئەمە چاوپۆشیمان لێکردن.

ئەو کەسانەی داوای لێخۆشبونیان لەمعاویە کرد، وتیان: معاویە لەبەر ئەوە زیادی پەیوەستی بنەماڵەکەی خۆی کرد چونکە هاوسەرگیری سەردەمی جاهلی شێوازی جۆراوجۆری بو کەپێویست بەئاماژەدان پێیان ناکات. یەکێکیان ئەوە بو کەچەند پیاوێك لەگەڵ ژنێکی لەشفرۆش دەخەوتن و کاتێك سکی پڕدەبو و منالی دەهێنایە دونیا، هەر کام لەپیاوانی بیویستایە، منالەکەی پەیوەستی خۆی دەکرد. کاتێك ئیسلام بلاوبویەوە، ئەم شێوازانەی لەهاوسەرگیری ناڕەوا کرد بەلام هەر منالێکی پەیوەستی بەباوکی کرد لەهەر شێوازێکی هاوسەرگیری و لەنێوان ئەم شێوازانە جیاوازی و جیایی دروست نەکرد. معاویە گومانی کرد ئەم کارە ڕەوایە و لەبەر ئەمە بۆ پەیوەست کردنی زیاد بەبنەماڵەکەی خۆی جیایی لەسەردەمی ئیسلام و سەردەمی جاهلی نەکرد. ئەمە قسەیەکی ناڕاستە چونکە موسوڵمانان بەگشتی لەسەر ناڕاستیەکەی کۆکن و لەرۆژگاری ئیسلامی ئەم شێوازە لەپەیوەست کردن روی نەداوە تا بتوانین پشتی پێ ببەستین.

دەستەیەك دەڵێن: دوای پەیوەست کردنی زیاد لەلایەن معاویە، زیاد بڕیاریدا حەج بکات. براکەی ئەبوبەکەرە ئەمەی بیست. ئەم برایە لەکاتی ناسازگاری زیاد بۆ شایەتی دان لەسەر زیناکاری موغەیرە کوڕی شەعبە، لەگەڵ ئەو ناسازگار و قسەی لەگەڵ نەدەکرد. کاتێك بیستی زیاد دەیەوێت حەج بکات، ڕۆشتە ماڵەکەی وبەیەکێك لەکوڕەکانی زیادی وت: کوڕی خۆم، بەباوکت بڵێ من (براکەت لەدایکەوە) بیستومە دەتەوێت حەج بکەیت. بەناچار بۆ ئەم مەبەستە دەڕۆیتە مەدینە. بێ گومان مەبەستی ئەوە دەکەیت چاوت بەدایکی حەبیبە کچی ئەبوسوفیان و هاوسەری پێغەمبەر بکەوێت. ئەگەر ئەم خاتونە میواندارێت بکات، هاوار لەو ریسواییەیی

بەسەر پێغەمبەر دێت. ئەگەر میوانداری تۆ نەکات، هاوار لەریسوایی ئەم جیهانە و ئەو تانە و سەرکۆنانەی دوژمنان لەتۆی دەدەن. زیاد چاوی لەحەج کردن پۆشی و وتی: خوا پاداشتی چاکەت بدات چونکە ئامۆژگاری منت کرد و چاکەت لەگەڵ کردم.

## شەڕی موهەلەب لەسند

لەم ساڵەدا موهەلەب کوڕی ئەبی صوفرە، بۆ شەڕ لەسنوری سند رەوانە کرا. سەرەتا بەرەو بەنەت و ئەهواز ڕۆشت کە لەنێوان مولتان تا کابوڵە و دواتر روبەروی دوژمن بویەوە و بۆ شەڕ ریزی بەست. موهەلەب لەسەرزەمینی قیقان چاوی بەهەژدە سوار لەتورکەکان کەوت کەشەڕیان لەگەڵ کرد و هەمویان کوژران. موهەلەب وتی: بۆ عەجەمەکان لەئێمە خێراتر و ئازاتربون! ئەو کلکی ئەسپەکانی بڕی (یا داغی کردن) و یەکەم کەس بو لەئیسلامدا ئەم کارەی کرد. ئەزدی سەبارەت بەشەڕی بەنەت دەڵێت:

الم تر ان الازد ليلة بيتوا          ببنة كانوا خير جيش المهلب

یانی: ئایا نەتبینی کاتێك ئەزدیەکان لەشەڕی بەنەت شەوانە هێرشیان کرد، باشترین شەڕکەرانی سوپاکەی موهەلەب بون؟

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك لەم ساڵەدا معاویە حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم لەمەدینە هەیوان و سایەوانی سەرداپۆشراوی پارێزگاری لێکراوی بۆ خۆی دروست کرد. ئەو یەکەم کەس بو لەمەدینە ئەم کارەی کرد. معاویە لەو ڕۆژەوە لەشام ئەو کارەی کرد کەیەکێك لەخەواریج هێرشی کردە سەر.

لەم ساڵەدا دایکی حەبیبە کچی ئەبوسوفیان و هاوسەری پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا روفاعەی عەدەوی لەعودەی رەباب کوژرا. ئەو بەصری بو و چاوی بەپێغەمبەر کەوتبو.

## ڕوداوەکانی ساڵی چل و پێنجی کۆچی( ٦٦٥ زایینی )

لەم ساڵەدا معاویە حارس کوڕی عەبداللەی ئەزدی وەك فەرمانداری بەسرە دەستنیشان کرد. ئەم کارە لەسەرەتایی ئەم ساڵە و بەدوای لەسەر کار لابردنی عەبدالله کوڕی عامر (لەخەڵکانی شام) ڕوی‌دا. فەرمانداری تازە، عەبدالله کوڕی عەمرۆی کردە سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی. حارس چوار مانگ لەپۆستەکەی مایەوە. دواتر معاویە ئەوی لەسەر کار لابرد و زیاد کوڕی ئوبیەیی کردە فەرمانداری بەسرە.

## فەرمانداری زیاد کوڕی ئوبیە لەبەسرە

لەم ساڵەدا زیاد کوڕی ئوبیە هاتە کوفە ومایەوە وچاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بیکەنە فەرمانداری ئەم شارە. موغەیرە کوڕی شەعبەیان لەم کارە ئاگادار کردەوە. موغەیرە ڕۆشتە لای معاویە وخوازیاری ئەوە بو لەفەرمانداری لابرێت و داوای لێکرد ماڵ و زەوی لەقرقیسیا پێ بدات تالەناو خەڵکانی قەیسدا ژیان بەسەر ببات. معاویە لێی ترسا و پێی وت: دەبێت لەسەر کارەکەی خۆت بمێنیتەوە. موغەیرە ڕازی نەبو و گومانی معاویە زیادی کرد وئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە. موغەیەرە شەوانە هاتە ناو کوفەو کەسێکی بۆ لای زیاد ڕەوانە کرد وئەوی لەو شارە دەرکرد.

دەستەیەك دەڵێن: موغەیرە نەڕۆشتە شام بەڵکو معاویە کەسێکی بەدوای زیاددا نارد کە لەکوفە بو. فەرمانی پێدا بەرەو بەسرە بڕوات. ئەوی وەك فەرمانداری بەسرە و خوراسان و سیستان دەست نیشان کرد. دواتر هند و بەحرەین وعەمانی پەیوەستی فەرمانڕەواییەکەی ئەو کرد. زیاد لەکۆتایی ڕەبیع الثانی ساڵی ٤٥ / ١٩ ژوئیەی ٦٦٥ زایینی ڕۆشتە ئەو شارە. خراپەکاری و نائارامی لەشارەکەدا ئاشکرا و بەربڵاو بو. ئەو وتاری (کلك بڕاوەکەی) لەم شارەدا پێشکەش کرد. بۆیە پێیان دەوت کلك بڕاو چونکە لەوتارەکەیدا وەسف وسوپاسی خوای نەکرد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی:

سوپاس بۆ خوا بۆ بەخشین وچاکەکاریەکانی. داوای بەخششی زیاتری لێدەکەین. ئەی خوایە، بەهەمان شێوە کەبەخشینەکانت بۆ ئێمە زیاد کرد، سوپاس کردن لەناو

دڵی ئێمەدا پەروەردە بکە. دوای سڵاو، نەزانی بێ شەرم و گومڕایی کوێر و خراپەکاری کە بۆ بکەرەکانی ئاگر هەڵدەگیرسێنێت و بڵێسەی ئاگر لەناو ئەواندا بەردەوام دەکات، ئەوەیە کەنەزانەکانی ئێوە دەیکەن و فرمزانەکانتان چاو لەم کارانە دەپۆشن. دەڵێی وتەکانی پێغەمبەرتان نەبیستوە و نوسراوی خواتان نەخوێندۆتەوە و نازان خوا بۆ فەرمانبەرانی چ پاداشێکی ئامادە کردوە و بۆ گوناحکاران چ سزایەك و ئەمە بەدرێژایی رۆژگار هەمیشەیی و هیچ کات کۆتایی بۆ نیە. ئایا هاوشێوەی ئەو کەسانەن ئەم جیهانە چاوی ئەوانی بەستوە و مەبەستەکانی جەستە گوێی ئەوانی کەڕ کردوە و جیهانی تێپەڕیان لەجیاتی جیهانی هەمیشەیی هەڵبژاردوە. بیرتان نایەت چەندین روداوتان لەئیسلامدا دروست کرد کەپێش ئێوە کەس بەو کارانە هەڵنەستاوە. ئەم ماڵی لەشفرۆشیانە ئاشکرا و ئەم ژنە پاك و بێگەردانە بەرۆژی روناکە دەبنە نیشانە و مەبەستی خراپەکاری و ژمارەیان کەم نیە. ئایا کەس لەناو ئێوەدا رێگر نیە تا گومڕاکان لەهێرشەکانی کۆتایی شەو و تاڵانیەکانی رۆژی روناك دور بخاتەوە و رێگریان لێ بکەن؟ خزمایەتیتان بەهێز کرد و دینتان لەخۆتان دور کردەوە. لەکاتی خۆیدا داوای لێخۆش بون ناکەن و پەنای دزەکان دەدەن. هەر کام لەئێوە نەزانەکانی خۆی دەپارێزێت بەشێوەیەك لەکۆتایی کارەکەی ناترسێت و لەرۆژی هەستانەوە ترسی نیە. ئێوە فرمزان نین چونکە لایەنگری لەنەزانەکان دەکەن. بەردەوام ئەم کارەتان کردوە و بەرگریتان لەوان کردوە تا ئەو جێگەی ئەو شتانەی ئیسلام پارێزگاری لێکردون، بەفیڕۆتاندا.

خواردن و خواردنەوە بۆ من ناڕەوایە تا هەموان لەگەڵ زەوی تەخت بکەم: یا خاپور بکەم یا بسوتێنم. دەبینم کۆتایی ئەم کارە بەرەو چاکی ناڕوات مەگەر بەوەی سەرەتاکەی بەرەو چاکە برد. نەرم و نیانی نە لەروی لاوازی و سستی و سەخت گیری نە لەبەر زۆر و زۆرداری. بەخواوەندی خوا سوێند دەخۆم دانیشتوی ماڵ بەتاوانی کۆچکەر و ئەو کەسەی دەگات لەجیاتی کەسی هەڵاتو سزا دەدەم و ساغ لەبەرابەر نەخۆش، تا پیاوێك لەئێوە ئەویتر ببینێت و بڵێت: ئەی سەعید رابکە چونکە سەعدیان لەناو برد! یا ئەوەی ڕمەکەی ئێوە بۆ من نەرم و نیان بێت. درۆ کردن لەسەر تەختی وتاردان، نەزانیەکەی بەناو بانگە. ئەگەر درۆتان لەمن بیست، ڕەوایە نافەرمانی من بکەن. هەرکەس شەوانە هێرشی بکەنەسەر، من تاوانەکەی قەرەبو دەکەمەوە. هاوار لەو کەسەی لەکاتی شەوڕەویدا دەیهێننە لای من چونکە خوێنی

دەرێژم. ئەوەندە مۆڵەتتان پێدەدەم تا هەواڵی ئەم وتارە بەکوفە بگات و بگەڕێتەوە. لەبانگەوازەکانی رۆژگاری جاهلی خۆتان بەدور بگرن چونکە هەر کەس ئەو بانگەوازە بێنێتە سەر زمان، زمانی دەبڕم.

ئێوە دیاردەی تازەتان دروست کردوە کەپێشتر بونیان نەبوە. ئێمەیش بۆ هەر گوناحێك سزایەکمان دیاری کردوە: هەرکەس ئاگر لەماڵی کەسێکی دیکە بەربدات، دەیسوتێنین وهەرکەس کەسێك لەناو ئاودا بخنکێنێت، دەیخنکێنین و هەرکەس بڕواتە ناو ماڵێك، دەڕۆینە ناو دڵی و هەرکەس گۆڕێك هەڵبداتەوە، بەزیندویی بەخاکی دەسپێرین. دەست و زمانتان لەئێمە بەدور بگرن تا دەست و زمانم لەئێوە بەدور بگرم. ئاگادار بن ئەو کەسەی ناسازگاری لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵك بکات، دەیکوژم. لەرابردودا لەنێوان من و دەستەیەك لەخەڵك رق و کینە بوە کەئەوانەم خستۆتە پشت گوێ و ژێر قاچی خۆم. هەرکەس چاکەکارە، چاکەکاری زیاد بکات وهەر کەس خراپەکارە، دەست لەخراپەکاری هەڵبگرێت. ئەگەر بزانم یەکێك لەئێوە لەرقی من گرفتاری سك ئێشە بوە، پەردەی ئەو نادڕێنم تا خۆی روخساری بەمن نیشان بدات و خراپەی من باس بکات و ئەو کات ئیتر مۆڵەتی پێ نادەم. کەواتە کارەکانی خۆتان لەسەرەتاوە دەست پێبکەن وهاوکاری یەك بکەن چونکە زۆرن ئەو کەسانەی بەهاتنی ئێمە شادمانن و دواتر خەمبار دەبن و زۆرن ئەو کەسە شادمانانەی بێزار دەبن.

ئەی خەڵکینە، ئێستا ئێمە بوینەتە فەرماندار و پارێزەری ئێوە. لەسەر بنەمایی فەرمانڕەوایی خوایەك کە بەئێمەی بەخشیوە، کاروباری ئێوە دەسوڕێنین و بەو سامانەی خوا خستویەتیە بەردەستی ئێمە، پارێزگاریتان لێ دەکەین. لەسەر ئێوەیە فەرمانبەر و گوێرایەڵی ئەو کارانە بن کەرەزامەندی ئێمەی لەسەرە و لەسەر ئێمەیە دادپەروەری بکەینە پیشە. لەرێگەی چاکەخوازیەوە، خۆتان شیاو بکەن بۆ دادپەروەری و سامانەکانی ئێمە و بزانن ئەگەر لەهەر کارێکدا کەمتەرخەمی بکەم، لەسێ کاردا نایکەم: خۆم لەنیازمەند بەدور ناگرم ئەگەر شەوانەیش لەدرگای ماڵەکەی من بدات و رۆژی لەکەس ناستێنمەوە و بەخشینەکان پشت گوێ ناخەم و لەپێشی بەدەستەیەك نابەخشم. لەخوا بپارێنەوە تا رێبەرەکەتان بەتەندروستی بهێڵێتەوە چونکە بەرێوبەر و ئامۆژگاری ئێوەیە و بەردەوام ئێوە لەپەنای خۆیدا دەپارێزێت. هەرچەند گوێرایەڵتر بن، ئەوان باشتر دەبن. رقی ئەوان لەدڵ مەگرن چونکە دەبێتە هۆی تورە بونی ئەوان و بەردەوام بۆ ئەوە داخ دەخۆن. بۆ بەدەست هێنانی نیازەکانتان پەلە مەکەن چونکە

ئەگەری هەیە ئەگەر نیازەکانتان بێتەدی، بۆ ئێوە خراپ بێت. لەخوا دەپارێمەوە هەموان لەهەمو کارەکاندا بەختەوەر بکات. ئەگەر دەبینم دەمەوێت کارێك لەناو ئێوەدا بلاو بکەمەوە، بەهەموتالی و ناسازگاریەکانەوە پێی رازی ببن. ئێوە بەدەستی من کەسانی زۆرتان لێ دەکوژرێت. خۆتان بەدور بگرن تا یەکێك لەکوژراوەکانی من نەبن.

عەبداللە کوڕی ئەهتەم هەستا و وتی: ئەی فەرماندار، فرمزانی و زمان پاراویی بێ کۆتاییان بەتۆ بەخشیوە. زیاد وتی: درۆت کرد چونکە ئەمە تایبەتمەندی داوودە کەپێغەمبەری خوا و خوا لەقورئاندا باسی دەکات. ئەحنەف وتی: ئەی فەرماندار، قسە چاکەکانت هێنایە سەر زمان. وەسف کردن دوای تاقی کردنەوەیە و سوپاس کردن بەدوای بەخششدا دێت. زیاد وتی: راستت وت. ئەبو بیلال مەرداس کوڕی ئودەیە لەخەواریج، هەستا و وتی: خوا ئاماژەی بەشتێکی جیاواز لەوتەکانی تۆداوە. خوای گەورە فەرمویەتی: ئیبراهیم ئەم پەیامەی گەیاند کەهیچ کەس تاوانی گوناحی کەسێکی دیکە هەڵناگرێت و خەڵك تەنیا بەرهەمی دەستڕەنجی خۆیان دەخۆن(نجم /٣٧/٥٣—٣٩)خوا مژدەی شتی باشتری پێدوان لەوەی تۆ مژدەمان پێ دەدەیت و دەمانترسێنیت ئەی زیاد! زیاد وتی: بەو شتەی تۆ و هاورێکانت دەتانەوێت، ناگەم مەگەر ئەوەی لەناو خوێنەکاندا مەلە بکەم.

زیاد عەبداللە کوڕی حیصنی کردە سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی. مۆڵەتی بەخەڵکدا تا ئەم هەواڵە بەکوفە گەیشت و هەواڵی گەیشتنی هەواڵەکە بەکوفە گەیشت. ئەو نوێژی خەوتنی دوادەخست و دواتر نوێژی دەخوێند و فەرمانی بەپیاوێك دەدا سورەی (بقره) بە لەسەرخۆیی بخوێنێتەوە. کاتێك خوێندنی قورئانی تەواو دەکرد چاوەڕوانی دەکرد بەئەندازەیەك کەسێك بگاتە دورترین شوێنی بەسرە. لەم کاتەدا فەرمانی بەسەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دەدا بڕواتەدەر. هەر کەسێکیان دەگرت، بێ درەنگ دەیانکوشت (لەشەوی یەکەم حەوت سەد سەری بڕاویان خستە بن دیواری ماڵەکەی) شەوێك پیاوێکی بیابانگەڕیان هێنا بۆ لای زیاد. زیاد وتی: ئایا وتارەکەی ئێمەت نەبیست؟ وتی: نەبەخوا! مەڕێکی شیردەرم بۆ لەوەڕین بردە دەرەوەی شار، لەناکاو دنیا تاریك بو و لەسوچێکدا دانیشتم و چاوەڕێم کرد تا بەرەبەیان بگات و نەمزانیوە فەرماندار چی وتوە. زیاد وتی: سوێند بەخوا گومان دەکەم تۆ راست دەکەیت بەلام چاکسازی خەڵك بەکوشتنی تۆیە. دواتر فەرمانیدا و کوشتیان.

زیاد یەکەم کەس بو فەرمانی پاشای سەختگیرانە بەکار دەبرد و پاشایەتی بۆ معاویە بەهێز کرد، شمشێرەکەی خۆی دەرکێشا، لەسەر بنەمایی گومان دەستگیری دەکرد و لەسەر هەمان بنەما سزایی دەدا. خەڵك لێی ترسان تا ئەو رادەیەك لەیەکتر ئەمین بون. ئەگەر شتێك لەدەستی ژنێك یا پیاوێك دەکەوت، کەس هەڵی نەدەگرت تا خاوەنەکەی دەهات و دەیبردەوە. کەس دەرگای ماڵەکەی دانەدەخست.

بەخشینەکانی فراوان کرد و بناغەی (شاری رۆژی) دارشت و پاسەوانەکانی بۆ چوارهەزار کەس زیاد کرد. پێیان وت: رێگاکان نائەمنە. وتی: تەنیا گرنگی بەم شارە دەدەم تا چاکسازی دروست بکەم. ئەگەر ئەم شارە زەخت لەمن بکات، کەسانێتر زیاتر زەخت دەکەن. کاتێك کاروباری شاری بەسرەی ساماندا، سەرقاڵی دەوروبەر بو و چاکسازی لەناوچەکانی دەوروبەر ئەنجامدا.

## کارگوزارەکانی زیاد

زیاد هاوکاری لەدەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر وەرگرت، لەناو ئەوان: عیمران کوڕی حوصەینی خوزاعی کەئەوەی کردە سەپەرستی دامەزراوەی دادی بەسرە، ئونس کوڕی مالك، عەبودلرەحمان کوڕی سەمورە، سەمورە کوڕی جەندەب.

عیمران داوای دەست لەکار کێشانەوەی کرد و زیاد رازی بو و عەبداللە کوڕی فەزاڵەی لەیسی لەجێگاکەی ئەو دانا. دواتر براکەی عاصم کوڕی فەزاڵەی کردە داواکاری گشتی و دواتر زوراره کوڕی ئەوفا مێردی خوشکەکەی زیاد.

دەستەیەك دەڵێن: زیاد کوڕی نوبیە یەکەم کەس بو ڕم و گورزەکانی پێش خۆی خست و پاسەوانەکانی کردە پاسەوانی خۆی. پاسەوانەکانی پێنسەد پیاو بون کەلەمزگەوت نەدەهاتنەدەر و پاسەوانیان دەدا.

خوراسانی کردە چوار بەش: لەمەرو ئەمیر کوڕی ئەحمەری دانا، لەنەیشابور خولەید کوڕی عەبداللە حەنەفی، لەمەرورود و فاریاب و تاڵەقان، قەیس کوڕی هەیسەم و لەهەرات و بادغیس و پوشەنگ نافع کوڕی خالدی تاحی کەدواتر لێی ڕەنجا و لەسەر کار لایبرد.

هۆکاری لەسەر کار لابردنی ئەوە بو: نافع مێزێکی دروست کراو لەدژە ژەهری (بەردێکی گرانبایی بۆ دەرمان و خۆجوان کردن) بۆ زیاد نارد کەقاچەکانی لەدژەژەهر بون. نافع پێش ناردنی ئەم مێزە یەکێك لەقاچەکانی لێکردەوە و قاچێکی زێرینی

لەجیاتی دانا بەکۆیلەکەی خۆی (زەید کەهەمە کارەی ئەو بو) بۆ زیادی نارد. زەید لای زیاد وتی: ئەو فێڵی کردوە و یەکێك لەقاچەکانی مێزەکەی تۆی دزیوە. زیاد ئەوی لەسەر کار لابرد و خستیە زیندانەوە و نامەیەکی قەرزی بەبڕی سەد هەزار یا هەشسەد هەزار دره‌م بۆ نوسی. چەندین پیاو کەوتنە نێوانیانەوە و زیاد ئازادی کرد.

هەروەها حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری کردە فەرماندار. ئەو پێغەمبەری خوای بینیبو. زیاد بەدەرگاوانی وتبو: حەکەم بۆ لای من بێنە. مەبەستەکەی حەکەم کوڕی ئەبی عاصی سەقەفی بو کەئەوی کردبوە فەرمانڕەوایی خوراسان. دەرگاوان ڕۆشتەدەر و حەکەم کوڕی عەمرۆ غەفاری بینی و بانگی کرد. کاتێك زیاد ئەوی بینی، پێی وت: من تۆم نەویست بەڵکو خوا ویستی! دواتر ئەوی کردە فەرمانڕەوا و چەندین پیاوی بۆ کۆکردنەوەی باج لەگەڵدا رەوانە کرد، لەوان: ئەسلەم کوڕی زورعەی کەلابی و چەند کەسێکیتر. ئەو شەڕی تەخارستانی کرد و تالآنی زۆری دەست کەوت و دواتر مرد و پێش مەرگ ئەنس کوڕی ئەبی نوناس کوڕی زونەیمی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد کەزیاد ئەوی لەسەر کار لابرد و فەرمانڕەوایی خوراسانی بەخولەید کوڕی عەبداللە حەنەفی بەخشی. . دواتر رەبیع کوڕی زیادی حارسی هاوڕێ لەگەڵ پەنجا هەزار شەڕکەر لەخەڵکانی کوفە و بەسرە بۆ ئەو دیارە رەوانە کرد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم فەرمانداری مەدینە حەجی لەگەڵ خەڵك کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا زەید کوڕی سابتی ئەنساری مرد. دەستەیەك دەڵێن: ساڵی ٥٥ / ٦٧٥ زایینی مرد.

ئەم کەسانەیش مردن: عاصم کوڕی عودەی ئەنساری بەلەوی لەبەدریەکان کە بۆ شەڕ نەهات چونکە پێغەمبەر ئەوی بۆ مەدینە گەڕاندەوە و بەشەکەی بۆ هەڵگرت و ئەو بۆ ماوەی سەد و بیست ساڵ ژیا، سەلەمە کوڕی سەلامەی کوڕی وەقشی ئەنساری لەمەدینە لەئامادەبوانی (عەقەبە) و بەدر لەحەفتا ساڵیدا، سابت کوڕی زوحاك کوڕی خەلیفەی کەلابی لەئامادەبوان لە(بەیعەتی دار) برای جوبەیرە کوڕی زوحاك.

## روداوەکانی ساڵی چل و شەشی کۆچی ( ٦٦٦ زایینی )

لەم ساڵەدا مالك کوڕی عەبدالله یا عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید یا مالك کوڕی هوبەیرەی سەکونی زستانی لەسەرزەمینی رۆم بەسەر برد.
هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید لەرۆمەوە گەڕایەوە حمص و مرد.

## مردنی عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید

هۆکاری مردنەکەی ئەوە بو پێگەی لای خەڵکانی شام بەرز بویەوە و ئەوان رویان تێکرد چونکە باوکی کارە دژوارەکانی ئەنجامدابو و لەسەرزەمینی رۆم سامانەکانی فراوان و لەکاروبارەکانیدا بەهێز بو. معاویە ترسی ئەوی کەوتە دڵەوە و فەرمانی بە کوڕی ئوسالی مەسیحدا بۆ کوشتنی ئەو بیر لەفێڵێك بکاتەوە. بەڵێنیدا تا ئەو کاتەی زیندوە باجی لێوەرنەگرێت و کۆکردنەوەی باجی حمص بەو بسپێرێت. کاتێك عەبدولرەحمان لەرۆم گەڕایەوە، کوڕی ئوسال لەیەکێك لەشارەکانی خۆی خواردنەوەیەکی ژەهراوی دەرخوارددا، کەخواردی و لەحمص مرد و معاویە بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر.
جارێك خالید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی خالید بەرەو مەدینە بەرێکەوت و لای عوروە کوڕی زوبەیر دانیشت. عورە لەکارەکەی کوڕی ئوسال ئاگاداری کردەوە. خالید بەرەو حمص بەرێکەوت و کوڕی ئوسالی کوشت. ئەویان بردە لای معاویە و ماوەیەك خستیانە زیندانەوە و دواتر خوێنبایی دا و ئازادیان کرد. خالید بەرەو مەدینە ڕۆشت و لای عوروە دانیشت. عوروە وتی: کوڕی ئوسال چی بەسەرهات؟ خالید وتی: کوشتم، بەڵام کوڕی جەرموز (بکوژەکەی زوبەیر) چی بەسەر هات؟ عوروە بێدەنگ بو.

## بزوتنەوەی سەهم و خەتیم

لەم ساڵەدا خەتیم شۆڕشی کرد کەناوی یەزید کوڕی مالکی باهلیە. سەهم کوڕی غالبی هوجەیمشی شۆڕشی کرد. ئەم دوانە جاڕیاندا: فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا. سەهم ڕۆشتە ئەهواز و ئایینی خەواریجی زیندو کردەوە و دواتر گەڕایەوە و داوای ئەمانی کرد. بەڵام زیاد ئەمانی پێ نەبەخشی و بەدوایدا گەڕا و کوشتی و لەماڵەکەی خۆی لەداریدا.

زیاد خەتیمی ڕەوانەی بەحرەین کرد و دواتر بانگی کردەوە. بەموسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی وت (باوکی قوتەیبە کوڕی موسلیم): بەڵێن لەو بۆ من وەربگرە. ئەم کارەی نەکرد و وتی: ئەگەر لەدەرەوەی ماڵەکەوی خەوت، ئاگادارت دەکەمەوە. دواتر موسلیم ڕۆشتە لای و وتی: خەتیم دوێ شەو لەماڵەکەی خۆیدا نەبو. زیاد فەرمانیدا و کوشتیان و لەناو هۆزی باهلە فڕێیاندا. پێشتر ئاماژەمان بەم داستانەدا. بۆیە لێرەدا باسمان کرد چونکە لەم ساڵەدا کوژرا.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەتەبە کوڕی ئەبوسوفیان لەکارگوزرانی معاویە لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا صالح کوڕی کەیسان خزمی بەنی غەفار یا یەنی عامر یا خوزاعی کۆچی دوایی کرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی چل و حەوتی کۆچی( ٦٦٧ زایینی )

## لەسەر کار لابردنی عەبداللە کوڕی عەمرۆ لەمیسر دانانی کوڕی حودەیج

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاص لەفەرمانداری میسر لەسەر کارلابرا و معاویە لەجیاتی ئەو معاویە کوڕی حودەیجی دانا کەلایەنگری عوسمان بو. عەبدولرەحمان کوڕی ئەبوبەکر ڕۆشتە لای و پێی وت: ئەی معاویە، پاداشتی خۆت لەمعاویە وەرگرت. براکەی منت کوشت تا ببیتە فەرمانداری میسر و بویتە فەرماندار. وتی: تەنیا لەبەر ئەوەی عوسمانی کوشت، کوشتم. عەبدولرەحمان وتی: ئەگەر خوازیاری خوێنی عوسمان بویت، لەکارەکانی معاویە نەدەبویتە شەریك کەئەو هەڵس و کەوتەی لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری گرتەبەر و دواتر تۆ لەپێش هەمو خەڵکانەوە هەستایت و بەیعەتت لەگەڵ کرد.

## شەڕی غور

لەم ساڵەدا حەکەم کوڕی عەمرۆ ڕۆشتە کوێستانی غور و لەگەڵ خەڵکەکەی شەڕی کرد چونکە ئەوان لەدین هەڵگەڕابونەوە. بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر شارەکەی ئەواندا گرت و ئەسیر و تالآنی زۆری دەست کەوت. کاتێك حەکەم لەم شەڕە گەڕایەوە (بەوتەی هەندێ کەس) مرد. حەکەم لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خۆی لەروبار تێپەڕی کرد بەڵام هیچ شوێنێکی نەگرت. یەکەم کەس لەموسوڵمانان کە لەناوی روباری خواردەوە کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی حەکەم بو کەمەشکەکەی خۆی لەروبار پڕکرد و تێری خواردەوە و دواتر دەستنوێژی گرت و دو رەکعەت نوێژی خوێند. ئەو یەکەم موسوڵمان بو ئەم کارەی کرد.

## فێلی مەهلەب

مەهلەب هاورێ لەگەڵ حەکەم کوڕی عەمرۆ لەخوراسان بو و لەگەڵ ئەو بەشداری شەڕی لەیەکێك لەکوێستانەکانی تورك کرد. تورکەکان دۆڵ و ڕێگاکانیان لەوان گرت.

حەکەم بێزار و مەهلەبی کردە سەرپەرەستی کاروباری شەڕ. ئەو رێگە چارەیەکی دۆزیەوە تا یەکێك لەگەورەکانی تورکی گرت. پێی وت: یا ئێمە لێرە ببەدەر یا دەتکوژم. تورك پێی وت: لەیەکێك لەم رێگایانە ئاگرێکی گەورە داگیرسێنە و بارەکان بۆ ئەوێ رەوانە بکە وئەوان لەدەوری کۆدەبنەوە و رێگاکانی دیکە دەکەنەوە. لەرێگایەکی ترەوە بڕۆنە دەر و ئێوە نادۆزنەوە مەگەر ئەوەی دەرباز ببن. ئەم کارەی کرد و خەڵك رزگاریان بو و تالآنیەکانیان برد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەتەبە کوڕی ئەبوسوفیان یا عەنسەبە کوڕی ئەبو سوفیان لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. فەرماندارەکان هەمان فەرماندارەکانی ساڵەکانی پێشو بون.

## رووداوەکانی ساڵی چل و هەشتی کۆچی( ٦٦٨ زایینی )

لەزستاندا عەبدولرەحمانی قەینی لەئەنتاکیە بو و لەهاویندا عەبدالله کوڕی قەیسی فەزاری و مالك کوڕی هوبەیرەی سەکونی لەدەریا شەڕی دەکرد. عوقبە کوڕی عامری جوهەنی بەهاوکاری میسریەکان و خەڵکانی مەدینە شەڕی دەکرد.

لەم ساڵەدا زیاد غالب کوڕی فەزالەی لەیسی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کرد. ئەو چاوی بەپێغەمبەر کەوتبو. مەروان حەجی لەگەڵ خەڵك کرد و چاوەڕوانی لەسەر کار لابردنی دەکرد چونکە معاویە لێی توڕە ببو. معاویە کەفەدەکی پێ بەخشیبو، لێی سەندەوە. فەرماندارەکان هەمان فەرماندارەکانی ساڵەکانی پێشو بون.

## روداوەکانی سالی چل و نۆی کۆچی( ٦٦٩ زایینی )

لەم سالەدا مالك کوڕی هوبەیرە زستانی لەسەرزەمینی رۆم بەسەر برد. هەروەها لەم سالەدا فەزالە کوڕی عوبەید هێرشی کردە سەر جەربە و دەستی بەسەردا گرت و زستانی لەوێ بەسەر برد و سامانی زۆری دەستکەوت. لەم سالەدا عەبدالله کوڕی کورزی بەجەلی لەدەرەوەی شارە ئیسلامیەکان هاوینی بەسەر برد. یەزید کوڕی شەجەرەی رەها‌وی لەدەریا شەڕی کرد و زستانی لەناو خەلکانی شام بەسەر برد. عوقەبە کوڕی نافع شەڕی لەدەریا ئەزمون کرد و لەزستان لەناو خەلکانی میسر حەسایەوە.

## شەڕی کۆنستانیتن نۆپێل

لەم سالەدا یا سالی ٥٠ /٦٧٠ زایینی معاویە سوپایەکی گەورەی بۆ سەرزەمینی رۆم رەوانە کرد و سوفیان کوڕی عەوف کردە فەرماندە و فەرمانی بەیەزیدی کوڕی دا هاورێ لەگەل ئەو شەڕ بکات. یەزید لاوازی و تەمەلی لەخۆی نیشاندا و باوکی پشت گوێی خست. خەلك لەشەڕەکەدا گرفتاری برسیەتی و نەخۆشیەکی کوشندە بون و یەزید وتی:

| | |
|---|---|
| ما ان ابالی بما لاقت جموعهم | بالفرقدونة من حمی و من موم |
| اذا اتکات علی الا نماط مرتفقا | بدیر مران عندی ام کلثوم |

یانی: ترسم نیە کە سوپاکەی ئەوان لەفەرقدونە گرفتاری چ نەخۆشیەکی مەترسیدار بون، ئەگەر لەجێگا نەرم و گەرمەکاندا نارامم گرتبێت و لەمالی مەران لەباوەشی دایکی کولسوم بەسەر ببەم.

دایکی کولسوم هاوسەری یەزید کچی عەبدالله کوڕی عامر بو.

ئەم هۆنراوەیە بەگوێی معاویە گەیشت. سوێندی خوارد کە دەبێت بێ چەند و چون لەسەرزەمینی رۆم پەیوەستی سوفیان بێت تا ئەو بەلای بەسەر خەلکدا هاتوە، بەسەر ئەویشدا بێت. ئەو هاورێ لەگەل دەستەیەکی فراوان کەباوکی لەگەل ئەودا رەوانەی کرد، بەرێکەوت. لەم سوپایەدا کوڕی عەباس و کوڕی عەمرۆ و کوڕی زوبەیر

و ئەبو ئەیوبی ئەنساری و عەبدولعەزیز کوڕی زوورارەی کەلابی وکەسانی دیکە دەبینران. ئەوان لەقولایی ڕۆم پێشڕەویان کرد تا گەیشتنە کۆنستانتین نۆپێل. موسوڵمانان و ڕۆمیەکان چەند ڕۆژێك شەڕیان کرد و شەڕ لەنێوان ئەوان ڕوی لەدژواری و سەختی کرد. عەبدولعەزیز بەردەوام خۆی بۆ کوشتن و گیانبازی ئامادە دەکرد، بەڵام نەکوژرا. دوای ئەمە وتی:

| | |
|---|---|
| قد عشت فی الدهر اطوار اعلی طرق | شتی فصادفت منها اللین و البشعا |
| کلا بلوت فلا النعما تبطرنی | و لا تجرعت من لاوانها جزعا |
| لا یملا الامر صدری قبل موقعه | و لا اضیق به ذرعا اذا وقعا |

یانی: لەم ڕۆژگارە بەشێوەی جۆراوجۆر و لەرێگە سازگار و ناسازگارەکان ژیانم بەسەر برد، هەم نەرم و نیانیم بینی، هەم توندی و سەختگیری. من هەمو شتێکم ئەزمون کرد و ئێستا هەرگیز، نەکەڵك وەرگرتن لەخۆبایی و خۆپەسەندم دەکات و نەسەختی و دژواری دەمخاتە ڕەنجەوە و بەشین و گریان ناچارم دەکات. کارێکی پێشوەخت دڵم پڕ ناکات و کاتێك ڕوبدات و هێرش بکاتە سەر من، دڵتەنگ وبێزار نابم.

دواتر هێرشی کردە سەر دەوروبەرەکەی خۆی و زۆر لەوانی کوشتار کرد و لەقولایی ئەوان ڕۆشتە پێش. ڕۆمیەکان بەرمەکانی خۆیان هێرشیان کردە سەر و جەستەیان شەقار شەقار کرد و کوشتیان. خوا لێی خۆش بێت. هەواڵی کوژرانی ئەو بەمعاویە گەیشت، بەباوکی وت: سوێند بەخوا جوامێری عەرەبەکان کۆچی دوایی کرد. وتی: کوڕی من یا کوڕەکەی تۆ؟ وتی: کوڕی تۆ، خوا پاداشت بداتەوە. باوك وتی:

| | |
|---|---|
| فان یکن الموت اودی به | و اصبح مخ الکلابی زیرا |
| فکل فتی شارب کاسة | فاما صغیرا و اما کبیرا |

یانی: ئەگەر مەرگ ئەوی لەپێ خستوە، و ئەگەر مێشکی کەلابی بۆتە هاونشینی ژنان، هەر جوامێرێك پیاڵەکەی خۆی هەڵدەدات، یا لەبچوکی یا لەگەورەیی.

دواتر یەزید و سوپاکە بۆ شام گەڕانەوە. لەم کاتەدا ئەبو ئەیوبی ئەنساری مرد و ئەویان لەکۆنستانتین نۆپێل بەخاك سپارد و ئێستا خەڵك وەك شوێنێکی پیرۆز سەردانی دەکەن. ئەو لەشەڕی بەدر و ئوحود و هەمو شەڕەکانیتر شان بەشانی

پێغەمبەر شەڕی کرد. لەصەفین و شەڕەکانی دیکە شان بەشانی عەلی شەڕی کرد.

## لەسەر کارلابردنی مەروان کوڕی حەکەم لەمەدینەهاتنە سەر کاری سەعید کوڕی عاص

لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاول / ئاوریلی ٦٦٩ زایینی معاویە مەروان کوڕی حەکەمی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و سەعید کوڕی عاصی لەجێگەی ئەو دانا. سەعید لەمانگی رەبیع الثانی / مەی ٦٦٩ زایینی هاتە سەر کار. دەورانی فەرمانڕەوایی مەروان کوڕی حەکەم لەمەدینە هەشت ساڵ و دو مانگ بو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی مەدینە عەبداللە کوڕی حارس کوڕی نەوفل بو. سەعید ئەوی لەسەر کار لابرد و ئەبو سەلە کوڕی عەبدولرەحمانی کردە سەرپەرەستی دامەزراوەی داد.

## مردنی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەلی ماڵئاوایی لەجیهان کرد. هاوسەرەکەی جەعدە کچی ئەشعەس کوڕی قەیسی کەندی ژەهرخواردی کرد. وەسیەتی کرد لای پێغەمبەر بەخاکی بسپێرن مەگەر ئەوەی ئاژاوە دروست ببێت و ئەوسا لەگۆڕستانی موسوڵمانان بەخاکی بسپێرن. حسەین داوای فەرمانی لەعایشە کرد و عایشە فەرمانی ئەو کارەی پێدا. کاتێك مرد، ویستیان لای ئارامگای پێغەمبەر بەخاکی بسپێرن، سەعید کوڕی عاص فەرمانداری مەدینە رێگری نەگرت بەڵام مەروان کوڕی حەکەم رێگەی لێگرتن و ئومەوییەکان و شوێنەکەوتوانی خۆیانیان کۆکردەوە و نەیانهێشت لای ئارامگای پێغەمبەر بەخاکی بسپێرن. حسەین ویستی گرنگی بەوان نەدات بەڵام پێیان وت: براکەت وەسیەتی کردوە، ئەگەر لەئاژاوە ترسان، روبکەنە گۆڕستانی موسوڵمانان. ئەمە ئاژاوەیە. حسەین بێدەنگ بو و سەعید کوڕی عاصی نوێژی لەسەر خوێند. حسەین پێی وت: ئەگەر ئەم کارە سونەت نەدەبو، نەمدەهێشت نوێژی لەسەر بخوێنیت.

## ڕوداوەکانی ساڵی پەنجای کۆچی( ٦٧٠ زایینی )

لەم ساڵەدا بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا و سوفیان کوڕی عەوف ئەزدی لەسەرزەمینی ڕۆم شەڕیان کرد و فەزاڵە کوڕی عوبەیدی ئەنساری لەدەریا شەڕی کرد.

## مردنی موغەیرە کوڕی شەعبە

## فەرمانداری زیاد لەکوفە

بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا لەمانگی شەعبان/ سێپتامبەری ٦٧٠ زایینی موغەیرە کوڕی شەعبە مرد. ئەمە ڕاستە. لەشاری کوفە نەخۆشی تاعون بڵاو ببویەوە. موغەیرە لە تاعون ڕایکرد و کاتێك کۆتایی پێهات، بۆ شار گەڕایەوە بەڵام تاعونی گرت و مرد.

پیاوێك بو باڵابەرز و یەك چاو. یەکێك لەچاوەکانی لەشەڕ یەرموك لەدەستدابو. لەحەفتا ساڵیدا مرد. دەستەیەك دەڵێن: مەرگی ئەو لەساڵی ٥١/ ٦٧١ زایینی یا ٤٩ /٦٦٩ زایینی ڕویدا.

کاتێك موغەیرە مرد، معاویە فەرمانداری بەزیاد کوڕی نوبیە سپارد. زیاد یەکەم کەس بو فەرمانڕەوایی هەردوشاری کوفە و بەسرەی گرتە دەست. کاتێك بۆ فەرمانداری دەست نیشان کرا، بەرێکەوت و سەمورە کوڕی جەندەبی وەك جێگری خۆی دیاری کرد. زیاد شەش مانگ لەکوفە بەسەری دەبرد و شەش مانگ لەبەسرە. کاتێك گەیشتە کوفە، ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتارێکی پێشکەش بەخەڵکانی کوفە کرد. ئەو کاتەی لەسەر تەختی وتاردانەکە بو، بەوردە بەرد بەردبارانیان کرد. ئەو دانیشت تا دەستیان لەو کارەیان هەڵگرت. دواتر دەستەیەك لەکەسە تایبەتەکانی خۆی بانگ کرد و هاتنە ناو مزگەوتەکە و دەرگاکەیان داخست. دواتر وتی: دەبێت هەرکەس هاونشینەکەی خۆی بگرێت وبڵێت: نازانم هاونشینەکەم کێ بو. دواتر فەرمانیدا و تەختێکیان هێنا و لەسەر دەرگای مزگەوت دایاننا و ئەوان چوارچوار سوێندیان دەخوارد و دەیانوت: هیچ کام لەئێمە وردە بەردی فڕێنەدا. هەر کەسێك

سوێندی خوارد، ئازادی کرد تا گەیشتنە سی کەس یا هەشتا کەس و لەهەمان کات دەستی ئەوانی بڕی.

یەکەم کەس کە لەکوفە بەدەستی زیاد کوژرا، ئەوفا کوڕی حیصن بو. وتەیەکیان لەو بۆ زیاد گێڕابویەوە. زیاد بەدوایدا گەڕا و هەلآت. زیاد لەناو خەڵکاندا گەڕا و ئەوی دۆزیەوە. پرسی: ئەمە کێیە؟ وتی: ئەوفا کوڕی حیصن. زیاد وتی: پێ نەزانەکان ئەو دەهێننە لای تۆ. لێی پرسی: بۆچونت سەبارەت بەعوسمان چیە. وتی: زاوای پێغەمبەر بو بۆ دو کچی. وتی: سەبارەت بەمعاویە چی دەڵێیت؟ وتی: بەخشەرێکی خۆڕاگرە. وتی: سەبارەت بەمن چی دەڵێیت؟ وتی: بیستومە لەبەسرە وتوتە، بێ گومان تەندروست لەجیاتی نەخۆش و ئەو کەسەی دێت لەجیاتی هەڵاتو سزا دەدەم. زیاد وتی: وتومە. داگیرسێنەری شەڕ لەخراپترین دەستەکان نیە. زیاد لەهەمان کات ئەوی کوشت.

کاتێك زیاد هاتە کوفە، عومارە کوڕی عوقەبە کوڕی ئەبی موعیت پێی وت: شوێنکەوتوانی ئەبو توراب بۆلای عەمرۆ کوڕی حەمیق هاتوچۆ دەکەن. زیاد کەسێکی بەدوای ئەودا نارد و وتی: ئەم کۆبونەوانە لەماڵەکەی تۆدا بۆ چ کارێکە؟ لەگەڵ هەر کەسێك دەتەوێت قسە بکەیت، دەبێت لەناو مزگەوتا بێت. دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی ئەم هەواڵەی لەدژی عەمرۆ کوڕی حەمیق بەزیاد گەیاند، یەزید کوڕی رویەم بو. زیاد پێی وت: لەخوێنی ئەو دا مەلە دەکەیت. ئەگەر بزانم مێشکی ئێسقانەکەی لەرقی من دێتەدەر، تا ئەو کاتەی دژی من شۆڕش نەکات، کارم پێی نیە. کاتێك بەردبارانیان کرد، ماڵێکی بۆ خۆی دروست کرد و پاسەوانی بۆ دانا.

کاتێك سەمورە کوڕی جوندەب وەك جێگری زیاد لەبەسرە دەستنیشان کرا، لەم شارەدا کوشتارێکی زۆری کرد. ئیبن سیرین دەڵێت: سەمورە لەنەبونی زیاد هەشت هەزار کەسی کوشت. زیاد وتی: ناترسیت بێ گوناحێکت کوشتبێت؟ وتی: ئەگەر بەو ئەندازەیە خەڵکی دیکە بکوژم، ترسم نیە. ئەبو سەواری عەدەوی وتی: سەمورە لەبەرەبەیانێك چل و حەوت کەسی لەبنەماڵەی من کوشت کەهەمویان لەکۆکەرەوەکانی قورئان بون. رۆژێك سەمورە سوار بو و پاسەوانەکانی کەسێکیان بینی و کوشتیان. سەمورە لای ئەو تێپەڕی کە لەناو خوێنەکەی خۆیدا دەتلایەوە. وتی:

ئەمە چیە. وتیان: پێشەنگەکانی سوپاکەت ئەویان کوشت. وتی: کاتێك بیستتان ئێمە سوار بوین، لەڕمەکانی ئێمە خۆتان بەدور بگرن.

## شۆڕشی قەریب

لەم ساڵەدا قەریب ئەزدی و زوحاف تایی کەکوڕە خاڵی یەك بون، لەبەسرە شۆڕشیان کرد و سەمورە لەبەسرە بو و زیاد لەکوفە. قەریب و زوحاف ڕۆشتنە لای بەنی زوبەیعە کەحەفتا پیاو بون. پیرە پیاوێك لەوانیان کوشت. پیاوانێك لەبەنی عەلی و بەنی راسب لەبەرابەر قەریب و زوحاف خۆڕاگریان کرد و ئەوانیان تیربارانیان کرد. عەبدالله کوڕی ئەوسی تاحی قەریبی کوشت و سەری ئەوی هێنایەوە.

زیاد لەکاروباری خەواریج سەختگیری کرد و فەرمانی بەسەمورەدا ئەویش ئەم کارە بکات. ئەو دەستەیەك لەوانی کوشت. زیاد ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: ئەی خەڵکانی بەسرە، یا زیانی ئەوان لەمن دوربکەنەوە یا لەئێوە دەست پێدەکەم! سوێند بەخوا ئەگەر یەك کەس لەوان گیان بەدەر ببات، یەك درەم لەبەشەکەی خۆتان بەرناکەوێت. خەڵك هەڵخران وئەوانیان کوشتار کرد.

## ئاهەنگی معاویە بۆ بردنی تەختی وتاردان لەمەدینە

لەم ساڵەدا معاویە فەرمانیدا تەختی وتاردانی پێغەمبەر لەمەدینەوە بۆ شام ببەن. وتی: ئەم تەختە و داردەستەکەی پێغەمبەر لەمەدینە نامێنێتەوە چونکە خەڵکەکەی بکوژی عوسمان بون. داردەستەکەی داوا کرد کەلای سەعدی قورەزی بو. تەختی وتاردانەکەیان لەشوێنەکەی خۆی جولاند و خۆر گیرا بەشێوەیەك ئەستێرەکان دەرکەوتن. خەڵك ئەم کارەیان بەدژوار زانی و معاویە وازی لەمەبەستەکەی هێنا. دەستەیەك دەڵێن: جابر و ئەبو هورەیرە ڕۆشتنە لای و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران شیاو نیە تەختی وتاردانەکەی پێغەمبەر کەخۆی دایناوە، لەشوێنەکەی بجوڵێت و نابێت داردەستەکەی بۆ شام ببرێت. مزگەوتەکە لێرە ببە. ئەو وازی لەتەختەکەی هێنا و شەش قادرمەی پێ زیاد کرد ولەوەی کردبوی، داوای لێخۆش بونی کرد.

کاتێك عەبدولمەلیك کوڕی مەروان هاتە سەر کار، ئاهەنگی تەختی وتاردانەکەی کرد و قەبیصە کوڕی زوئەیب پێی وت: تۆ بەخوا سوێند دەدەم ئەم کارە نەکەیت. معاویە جولاندی و خۆر گیرا. پێغەمبەر وتویەتی: هەرکەس لەسەر تەختی وتاردانی من سوێند بەدرۆ بخوات، شوێنی ئاگرەکەی پڕ دەکەن لەئاگر. ئەو لەمەدینە دەبەیتە دەر و ئەو (یا ئەو) بەمافە پچڕاوەکانی لای ئەوان دەمێنێتەوە! عەبدولمەلیك وازی لە مەبەستەکەی هێنا.

کاتێك کوڕەکەی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك هاتە سەر کار و حەجی کرد، ئاهەنگی ئەو کارەی کرد و سەعید کوڕی موسەییب کەسی بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز رەوانە کرد و پەیامی دا: لەگەڵ هاورێکەت قسە بکە تا ئاهەنگی مزگەوت و تورەیی خوا نەکات. عومەر قسەی لەگەڵ کرد و چاوی لەمەبەستەکەی پۆشی.

کاتێك سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك حەجی کرد، عومەر لەکارەکەی وەلید ئاگاداری کردەوە. سلێمان وتی: حەز ناکەم سەبارەت بەسەروەری باوەڕداران عەبدولمەلیك یا سەبارەت بەوەلید ئەم قسانە بێتە سەر زمان. ئێمە کارمان بەم کارە چیە! ئەم دنیامان دەستکەوت و لەدەستی ئێمەدایە. ئێستا دەمانەوێت ئاهەنگی نیشانەیەکی گەورە لەنیشانەکانی ئیسلام بکەین کەخەڵك لەشوێنە دورەکانەوە سەردانی دەکەن. دەمانەوێت بیهێنینە لای خۆمان، ئەو کارە بۆ ئێمە شیاو نیە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێکیتر

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی حودەیجی سەکونی لەفەرمانڕەوایی میسر لەسەر کار لابرا و مەسلەمە کوڕی موخەلید فەرمانڕوایی ئەم شارە و ئەفریقیەیی پێکەوە گرتە دەست. معاویە کوڕی ئەبو سوفیان پێش دەست نیشان کردنی مەسلیمە لەمیسر وئەفریقیە، عوقەبە کوڕی نافعی بۆ ئەفریقیە رەوانە کردبو. ئەو لەم دیارە بناغەی شاری قیروانی داڕشت. شوێنی قیروان، دارستانێك پڕ لەباڵندە و ماری جۆراوجۆر بو کەکەس روی تێنەدەکرد. ئەو لەخوا پاڕایەوە و هەمو ئەو ئاژەڵانە لەوێ دور کەوتنەوە بەشێوەیەك دڕندەکان بەچکەکانی خۆیان هەڵدەگرت و هەڵدەهاتن. مزگەوتی گشتیشی لەم شارەدا بنیات نا. کاتێك معاویە کوڕی ئەبو سوفیان معاویە کوڕی

حودەیجی لەفەرمانڕەوایی میسر لابرد، عوقبەی لەفەرمانڕەوایی ئەفریقیە لابرد و فەرمانڕەوایی هەردو ناوچەکەی بەمەسلیمە کوڕی موخەلید سپارد. ئەویەکەم کەسە فەرمانڕەوایی میسر و مەغربی پێکەوە گرتە دەست. مەسلیمە یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی باوکی موهاجیر لەئەفریقیە دانا و لەوێ مایەوە تا معاویە کوڕی ئەبو سوفیان کۆچی دوایی کرد.

## فەرمانداری عوقەبە کوڕی نافع لەئەفریقیە

## بناغەدانانی شاری قیروان

ئەبوجەعفەری تەبەری وتویەتی لەم ساڵەدا مەسلیمە کوڕی موخەلید بەفەرمانداری ئەفریقیە گەیشت. دەڵێت: عوقەبە پێش ئەو فەرمانڕەوایی ئەفریقیەیی دەکرد و بناغەی شای قیروانی داڕشت. ئەوەی مێژوونوسان ئاماژەیان پێداوە ئەوەیە کەفەرمانڕەوایی عوقەبە کوڕی نافع لەم ساڵەدا بو و لێرەبو بناغەی شاری قیروانی داڕشت. ئەو تا ساڵی ٦٧٥/٥٥ زایینی مایەوە و دواتر مەسلیمە کوڕی موخەلید بەفەرمانداری گەیشت. ئەوان زیاتر شارەزایی مێژووی سەرزەمینەکانی خۆیان و من تەنیا ئەوە دەگێڕمەوە کەئەوان ئاماژەیان پێداوە.

دەڵێن: معاویە کوڕی ئەبو سوفیان معاویە کوڕی حودەیجی تەنیا لەفەرمانڕەوایی ئەفریقیە لابرد و عوقەبە کوڕی نافعی فێهری لەجێگای ئەو دانا. ئەو لەرۆژگاری عەمرۆ عاص دانیشتوی بەرقە و زەویلە بو. ئەو لەو ناوچانە شەڕی کرد و دەستی بەسەر چەندین ناوچەدا گرت. کاتێك معاویە ئەوی دەست نیشان کرد، دەهەزار شەڕکەری بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد. ئەو ڕۆشتە لای ئەفریقیە و ئەو بەربەڕانەی باوەڕیان هێنا بو، پەیوەستی خۆی کرد و لەم ڕێگاوە ژمارەی سوپاکەی ئەو زیادی کرد. ئەو شمشێری خستە ناو خەڵکی ئەو ناوچەیە چونکە هەر کاتێك فەرمانداڕێك دەڕۆشتە ناو ئەوان، فەرمانبرداری خۆیان نیشان دەدا و کاتێك فەرماندار لەناو ئەواندا دەڕۆشت، پەیمانیان دەشکاند و لەدین هەڵدەگەڕانەوە. ئەو بەباشی زانی شارێك دروست بکات تا سوپای موسوڵمانان و بنەماڵەکانی ئەوان و سامانەکانیان لەوێ بمێننەوە تا لەشۆڕش و زیانی خەڵکان بەدور بن. ئەوبەرەو شوێنی قیروان ڕۆیشت کەدارستانێك بو لێوانلێو لەباڵندە و دڕندەکان و مارە ڕەنگاورەنگە جۆراوجۆرەکان. دۆعاکەی لای خوا وەرگیرا. لەخوا پاڕایەوە و داوتر وتی: ئەی مار و باڵندەکان! ئێمە هاورێکانی پێغەمبەری خواین. لێرە بڕۆن چونکە ئێمە لێرە دادەبەزین و دوای ئەوە ئەگەر هەر کام لەئێوە ببینین، بێدرەنگ دەتانکوژین. ئەوخەڵکانە لەو ڕۆژەدا سەیریان

کرد و بینیان دڕندەکان بێچوەکانی خۆیان هەڵدەگرن و هەڵدێن. خەڵکانێکی زۆر لەبەربەرییەکان ئەمەیان بینی، سەریان سوڕما و باوەڕیان بەئیسلام هێنا. فەرموی دارەکانیان بریەوە و ئەو دارستانە دڵگیرمیان کردە بیابانێکی روت و فەرمانی دا و بناغەی شارەکە دارێژرا و خەڵك مزگەوت و ماڵەکانی خۆیان دروست کرد. ماڵەکانی ئەوان سێ هەزار وشەشسەد بەغل (هەر بەغل ١٦٢ سانتی مەتر = ٥٨٣٢ مەتر = ٨٣٢ / ٥ کیلۆمەتر). ئەم کارە لەساڵی ٥٥ /٦٧٥ زایینی کۆتایی هات و خەڵکان لەوێ نیشتەجێ ببون. لەناو رۆژگاری دروست کردنی ئەو شارە، هێرشی دەکردە سەر ناوچەکانی دیکە و تالأنیان دەست دەکەوت. لەم رێگاوە، زۆر لەبەربەرییەکان باوەڕیان بەئیسلام هێنا و سنوری ئیمپراتۆری ئیسلامی فراوان بو و دڵی سوپایی نیشتەجێ لەوشارە لەقیروان زیادی کرد و ئەوان ئارام بونەوە و خوازیاری مانەوە بون وئیسلام لەوێ بەهێز بو.

## فەرمانداری مەسلیمە کوڕی موخەلید لەئەفریقیە

دواتر معاویە کوڕی ئەبی سوفیان لەمیسر وئەفریقیە مەسلیمە کوڕی موخەلیدی کردە فەرمانڕەوا. مەسلیمە یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی باوکی موهاجیری لەئەفریقیە دانا. ئەم کۆیلەیە رۆشتە ئەفریقیە و عوقبە کوڕی نافعی فێهری بەناڕاستی و ناپیاوی لەسەر کارەکەی لابرد و ریسوایی کرد. عوقبە روی کردە شام و معاویەی سەرکۆنە کرد لەبەر ئەو کارەی باوکی موهاجیر لەگەڵی کرد. معاویە داوای لێخۆشبونی کرد و مژدەی پێدا ئەو بۆ سەر کارەکەی بگەڕێنێتەوە بەڵام لەم کارەدا لاوازی لەخۆی نیشاندا. معاویە مرد و دوای خۆی کوڕەکەی یەزید هاتە سەر کار کەنافعی لەساڵی ٦٢ /٦٨٢ زایینی کردە فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانە.

واقدی دەڵێت: عوقبە کوڕی نافع لەساڵی ٤٦ /٦٦٦ زایینی بو بەفەرمانداری ئەفریقیە و بناغەی شاری قیروانی داڕشت و تا ساڵی ٦٢ /٦٨٢ زایینی مایەوە. ئەو عوقبەی خستە زیندانەوە و بارودۆخی لەو دژوار کرد. کاتێك ئەم هەواڵە بەگوێی یەزید کوڕی معاویە گەیشت و ئاگادار بویەوە چ بەڵایەك بەسەر عوقبەدا هاتوە، نامەیەکی بۆ باوکی موهاجیر نوسی و فەرمانی پێدا ئازادی بکات و رەوانەی لای ئەوی بکات. عوقبە گەیشتە لای یەزید و ئەوی بۆ فەرمانداری ئەفریقیە گەڕاندەوە و ئەو

باوکی موهاجیری گرت و خستیە زیندانەوە. واقدی گێڕانەوەی کویلەکەی بەم شێوەیە درێژە پێداوە کەئێمە بەخواستی خوای گەورە لەروداوەکانی ساڵی ٦٢ /٦٨٢ زایینی ئاماژەی پێدەدەین.

## هەڵاتنی فەرزدق لەدەستی زیاد

لەم ساڵەدا زیاد بەدوای فەرزدق گەڕا چونکە بەنی نەهشەل و فوقیەم گلەییان لێکردبو.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کەفەرزدق دەڵێت: من لەهۆنراوەکانی خۆم بەخراپی باسی ئەشهەب کوڕی رومەیلە و بەعیسم کرد و هەردوکیان لای خەڵك بێزران و ریسوا بون. بەنی نەهشەل و بەنی فوقەیم لای زیاد کوڕی نوبیە گلەیی و گازندەیان لەمن کرد و یەزید کوڕی مەسعود کوڕی خالید کوڕی مالکیش گلەیی دەست پێکرد. زیاد منی نەناسی تا پێیان وت: ئەو کوڕە بیابان گەڕەیە کەسامان وجل و بەرگەکانی خۆی بەفیڕۆدا. زیاد منی ناسیەوە.

فەرزدق دەڵێت: غالبی باوکم منی بۆ فرۆشتنی مەڕوماڵاتەکانمان رەوانە کرد تا خواردن و نیازەکانی دیکە بۆ دەستەبەر بکەم. مەڕوماڵاتم لەبەسرە فرۆشت و بەهاکەیم خستە ناو جلەکانم. پیاوێك لای من تێپەڕی و وتی: ئەم پارانە تۆی بەتەواوی قورس کردوە. ئەگەر ئەو پیاوەی من دەیناسم لەجێگەی تۆ دەبو، بەمشێوەیە پارەکانی نەدەشاردەوە. وتم کێیە؟ وتی: غالب کوڕی صەعصەعە (باوکی خۆم)من خەڵکانم بانگ کرد و درەمەکانم لەناو ئەواندا بڵاو کردەوە. یەکیان وتی: عاباکەی خۆت فرێبدە. عاباکەم دەرهێنا و فرێمدا. یەکیتر وتی: دەستارەکەی سەرت فرێبدە. ئەو کارەم کرد. یەکیتر وتی: پانتۆڵەکەت داکەنە. وتم: ئەو کارە ناکەم و خۆم روت ناکەمەوە چونکە شێت نیم. ئەم هەواڵە بەگوێی زیاد گەیشت. وتی: ئەو کوڕە شێتە و خەڵك بۆ تاڵان کردن هان دەدات. ئەو سوارەکانی رەوانە کرد تا من ببەن بۆ لای. پیاوێك لەبەنی هوجەیم سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی هات و وتی: رابکە، رابکە! منی لەپشت سەری خۆی سوار کرد و رزگارم بو. زیاد دومامەکەی من زوهەیل کوڕی صەعصەعە و زەحاف کوڕی صەعصەعەی گرت و ئەوانی زیندانی کرد بەڵام دواتر

ئەوانی ئازاد کرد. ڕۆشتمە لای باوکم و لەپێشهاتەکان ئاگادارم کردەوە. زیاد ڕقی باوکمی لەدڵ گرت.

دواتر ئەحنەف کوڕی قەیس و جاریە کوڕی قودامە (هەردوك سەعدی) و جەون کوڕی قەتادەی عەبشەمی و حوتات کوڕی یەزید باوکی مونازیلی موجاشعی وەك میوان ڕۆشتنە لای معاویە کوڕی ئەبو سوفیان. ئەو بەهەرکام سەد هەزار درەمی بەخشی و بەحەتات حەفتا هەزار درەم. کاتێك گەڕانەوە هەرکام سەیری خەلاَتیەکەی خۆیان کرد کەسەد هەزار درەم بو. حەتات بۆ لای معاویە گەڕایەوە. پرسی: بۆ گەڕایتەوە؟ حەتات وتی: منت لەناو بەنی تەمیم ڕیسوا کرد! ئایا نەژادم نیە؟ تەندروست نیم؟ لەناو خەڵکەکەی خۆم سەروەر نیم، هەموان فەرمان لەمن نابەن؟ وتی: با. حەتات وتی: بۆ بەشی منت کەمتر لەوان دا؟ (ئەو لەشەڕی وشتر لای عایشە شەڕی کردبو و ئەحنەف و جاریە لایەنگری عەلی بون). ئەحنەف و جەوەن لەشەڕ کردن دژی عەلی خۆیان بەدور گرت بەلاَم ئەویان خۆشدەویست. معاویە وتی: دینم لەوان کڕیەوە بەلاَم تۆم بەدین و باوەڕت بۆ عوسمان بەجێهێشت. حەتات شوێنکەوتەیی عوسمان بو. وتی: دینەکەی منیش بکڕە. معاویە فەرمانیدا و خەلاَتیەکەی ئەویان بۆ سەد هەزار درەم زیاد کرد. حەتات مرد و معاویە ئەو بڕە پارەی بەمناڵەکانی نەدا. فەرزدق لەمبارەوە وتی:

ابوك و عمی یا معاوی اورثا ... تراثا فیحتار التراث اقاربه

فما بال میراث الحتات اخذته ... و میراث صخر جامد لك ذائبه

فلو كان هذا الامر فی جاهلیة ... علمت من المرء القلیل حلائبه

ولو كان فی دین سوی ذا شننتم ... لنا حقنا اوغص بالماء شاربه

الست اعز الناس قدما و اسرة ... و امنعهم جارا اذا ضیم جانبه

و ما ولدت بعد النبی و آله ... كمثلی حصان فی الرجال یقاربه

و بیتی الی جنب الثریا فناءه ... و من دونه البدر المنیر كواكبه

انا ابن الجبال الشم فی عدد الحصی ... وعرق الثری عرقی فمن ذا یحاسبه

و كم من اب لی یا معاوی لم یزل ... اغریباری الریح ما ازور جانبه

نمته فروغ المالكین و لم یكن ... ابوك الذی من عبدالشمس یقاربه

| | |
|---|---|
| تراه كنصل السيف يهتد للندى | كريما يلاقى المجد ماطر شاربه |
| طويل نجاد السيف مذكان لم يكن | قصى و عبد الشمس ممن يخاطبه |

یانی: ئەی معاویە، باوکی تۆ و مامی من میراتێکیان بەجێهێشت. میراتێك کەهەرکام لەنزیکەکان هەڵیدەگرن و دەستی بەسەردا دەگرن. بۆ میراتی حەتات هەڵگرت و بەنێمەت نەدا لەهەمان کات میراتی باوکت (صەخر) لەدەستی تۆدایە و ڕەق و بەرد و بەستراو وەك مۆم لەدەستی تۆدا نەرمە؟. ئەگەر ئەم کارە لەرۆژگاری جاهلیدا رویدەدا، دەتبینی ئەو پیاوە مەڕ و ماڵاتی کەمی بۆ دۆشین هەیە کام یەك لەنێمەیە (من یا تۆ)ئەگەر لەئاییننێك جیاواز لەوە دەبو، ماڤ نێمەت نەدەخوارد و بەنێمەت دەبەخشی یا کارێکمان دەکرد ئاو لەقوڕگدا گیر بکات. مەگەر من لەهۆز و بنەماڵە دیارەکان نیم؟ کاتێك خەڵکان سەرکوت دەکرێن، مەگەر ئەو کەسەنیم پەنابەرەکەی خۆم بەباشترین شێوە دەپارێزم؟ دوای پێغەمبەر و بنەماڵەکەی کەسێکی تیژپێی وەك من لەناو خەڵکان لەدایك نەبوە کەبتوانرێت شەڕی لەگەڵدا بکرێت. ماڵەکەی من لەبەرزیدا بەرزترە لەئەستێرەی پەروین و ئەو مانگەی شەوی چواردە کەئەستێرەی روناکی بەدەورەوەیە، لەخوار ماڵەکەی من جێگیرە. من داگیرسێنەری ئاگری کێوە بەرزەکانم کەبەژمارەی وردە بەردەکانی بیابانن. لوتکەی بەرزترین کێوی سەرزەوی نەژادی منە، کێ دەتوانێت بەرابەری لەگەڵ بکات؟ ئەی معاویە، چەندە زۆرن لەباوك و باوکانی من کەبەردەوام سەروەری خەڵکەکەی خۆیان بون، لەگەڵ بادا ڕێگایان بڕیوە و بەلارێدا نەڕۆشتون. لقەکانی (دومالك) ئەوانیان رواندوە و گەورەیان کردوە و باوکی تۆ کەنەژادی بۆ عەبد شەمس دەگەڕێتەوە، نەیدەتوانی لەگەڵ ئەوان بەرابەری بکات. ئەو وەك نوکی شمشێر دەبینی کەبارانی بەخشینی لێ دەبارێت. ڕێزداری ئەوەیە پەیوەندیەکی نەپچڕاوی لەگەڵ گەورەییدا هەیە و نۆش کەرەکەی، تینو و سەرنەکەوتو ناگەڕێتەوە. باڵایەکی بەرزی هەیە، بەردەوام بەمشێوە بوە، قوصەی وعەبد شەمس لەو کەسانە نەبون توانیبێتیان ببنە هاوقسەی ئەو.

مەبەستی لە (دومالك) مالك کوڕی حەنزەلە و مالك کوڕی زەید مەناتە کەپێشینیانی ئەون. نەژادی فەرزدق بەمشێوەیە: کوڕی غالب کوڕی صەعصەعە کوڕی ناجیە کوڕی عقال کوڕی محەممەد کوڕی سوفیان کوڕی موجاشیع کوڕی دارم کوڕی

مالك كوڕی حەنزەلە كوڕی مالك كوڕی زەید مەنات كوڕی تیم.

كاتێك ئەم هۆنراوە بەگوێی معاویە گەیشت، سی هەزار درەمەكەی بۆ ماڵەكەی ئەو گەڕاندەوە و بەم كارە توڕەیی زیاد كوڕی ئوبییەی زیاد كرد. كاتێك خەڵكی نەهشەل و فوقەیم گازندەیان كرد، توڕەبونەكەی زیادی كرد وبەدوایدا گەڕا و فەرزدق رایكرد و ڕۆشتە لای عیسا كوڕی خوصەیلەی سولەمی و پێی وت: ئەم پیاوە بەدوای مندا دەگەڕێت و خەڵكان من لەخۆیان دور دەكەنەوە و من هاتومەتە لای تۆ تا پەنام بدەیت. عیسا وتی: بەخێر بێیت. سێ شەو لای ئەو مایەوە و دواتر پێی وت: بەباشی دەزانم بڕۆم بۆ شام. عیسا ئەوی رەوانە كرد. زیاد ئەمەی بیست و كەسی بەدوای ئەودا رەوانە كرد. فەرزدق ڕۆشتە رەوحا و لەناو خەڵكی بەكر كوڕی وایل مایەوە. ئەوان پەنایاندا و فەرزدق چەندین هۆنراوەی بۆ وەسف كردنی ئەوان هۆنیەوە.

دواتر ئەو كاتەی زیاد دەڕۆشتە كوفە، فەرزدق لەبەسرە دادەبزی و كاتێك دەهاتە بەسرە، فەرزدق دەڕۆشتە كوفە. هەواڵی ئەم كارە بەزیاد كوڕی ئوبیە گەیشت. ئەو فەرمانی بەفەرمانداری كوفەدا بەدوای فەرزدق بگەڕێت و بازداشتی بكات. فەرزدق لەكوفە ڕۆشتە دەر و بەرەو حیجاز بەڕێكەوت و پەنای بۆ سەعید كوڕی عاص برد و پەنایدا. فەرزدق لەمەككە یا مەدینە مایەوە تا زیاد مرد.

دەستەیەك دەڵێن: فەرزدق لەبەر ئەمە ئەو هۆنراوەی وت كەكاتێك حەتات باوەڕی بەئیسلام هێنا، پێغەمبەر لەنێوان ئەو و معاویە پەیوەندی برایەتی بەست. معاویە لەرێگەی ئەو پەیوەندیەوە میراتی لەو بەردەكەوت و فەرزدق ئەو هۆنراوەی هۆنیەوە. ئەم وتەیە ناڕاستە چونكە معاویە دەیزانی ئەم شێوەیە لەبرایەتی نابێتە هۆی ئەوەی میراتی بەركەوێت.

## مردنی حەكەم كوڕی عەمرۆ غەفاری

لەم ساڵەدا حەكەم كوڕی عەمرۆ غەفاری لەكاتی گەڕانەوە لەشەڕی (جبل الاشل) لەمەرو مرد. دەستەیەك ئەمەیان وتوە. ئاماژەمان بەگێڕانەوەی كەسانی دیكە سەبارەت بەمردنەكەی ئەودا. زیاد بۆی نوسیبو كە: سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم زەرد و سپی بۆ كۆبكەمەوە. زێر و زیو لەناو خەڵكدا نەبەخشمەوە. حەكەم

بۆی نوسی: ئەوەی سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوە، بەمن گەیشت. من نوسراوی خوام پێش نوسراوی معاویە بینی کەدەفەرمێت: زەوی وئاسمانەکان بۆ یەك مرۆڤ ئافرێنران و کاتێك خوا پەرستی پیشە کرد، خوا دەرگاکانی بۆ ئەو کردەوە و دواتر وتی: دارایی و بەشەکانی خۆتان لەگەنجینەی موسوڵمانان هەڵبگرن. حەکەم کوڕی عەمرۆ وتی: ئەی خوایە، ئەگەر چاکە لای تۆیە، من بۆ لای خۆت بگەڕێنەوە. لەبەر ئەمە بو لەمەرو مرد. ئەو پێغەمبەری خوای بینیبو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا معاویە ئایینی حەجی بۆ خەڵك ئەنجامدا. دەستەیەك دەڵێن: کوڕەکەی یەزید لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. فەرمانداڕەکانی لەشارەکان ئەوانەی ساڵەکانی پێشو بون.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: سەعد کوڕی ئەبی وەقاص لەعەقیق کەخەڵك جەستەی ئەویان لەسەر شان بۆ مەدینە گەڕاندەوە. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٥٤ / ٦٧٥ زایینی مرد. ساڵەکانی ژیانی ٧٤ یا ٨٣ ساڵ درێژەی کێشا و یەکێکە لەو دەکەسەی پێغەمبەر مژدەی بەهەشتی پێبەخشی. پیاوێکی ورگ زل و کورتە باڵا بو. صەفیە کچی حویی هاوسەری پێغەمبەر کەدەستەیەك دەڵێن لەرۆژگاری خەلافەتی عومەردا مرد، عوسمان کوڕی ئەبی عاصی سەقەفی، عەبدولرەحمان کوڕی سەمورە کوڕی حەبیب کوڕی عەبدشەمس (لەبەسرە)ئەبوموسای ئەشعەری کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٧٢/٥٢ زایینی کۆچی دوایی کرد، زەید کوڕی خالیدی جوهەنی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٨٧/٦٨ زایینی مرد. مەدلاج کوڕی عەمرۆ سولەمی. ئەو لەهەمو شەڕەکانی پێغەمبەر شان بەشانی ئەو شەڕی کرد. هەموی ئەم کەسانە پێغەمبەریان بینیوە.

## روداوەکانی ساڵی پەنجا و یەکی کۆچی (٦٧١ زایینی)

لەم ساڵەدا فەزاڵە کوڕی عوبەید زستانی لەسەرزەمینی رۆم بەسەر برد و شەڕی بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا لەهاویندا رویدا.

## کوژرانی حوجر کوڕی عودەی و عەمرۆ کوڕی حەمیق و هاوڕێکانیان

لەم ساڵەدا حوجر کوڕی عودەی و هاوڕێکانی کوژران.

هۆکارەکەی ئەوە بو معاویە لەساڵی ٦٦١/٤١ زایینی موغەیرە کوڕی شوعبەی وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان کرد. کاتێك بۆ ئەم پێگەیە بەرزی کردەوە، بانگی کرد و پێی وت: دوای سلاو، ئەو کەسەی خۆراگرە، پێش ئەمرۆ تایبەتمەندیەکی ئەوتۆی هەیە کەدەتوانێت داردەست هەڵگرێت، فرەزان، بێ هاوکاری، دەتوانێت بارێك لەسەر شانی تۆ سوك بکات. دەمویست پێشنیاری زۆرت پێ بکەم بەلام بەپشت گەرمی زانایی تۆ چاوپۆشیم کرد. بەلام پێشنیار کردنی یەك شت پشت گوێ ناخەم: جوێن دان و سەرکۆنە کردنی عەلی و خۆشەویستی نواندن بۆ عوسمان. عوسمان پەرەستەکان بەردەوام وەسف بکە و ئەوان لەخۆت نزیك بکەرەوە. موغەیرە وتی: ئەزمون کراوم و ئەزمون کراوەم. پێش تۆ فەرمانداریم بۆ کەسانێك کردەوە کەهیچ کات منیان سەرکۆنە نەکردوە. تۆیش ئەزمون دەکەیت، یاسەرکۆنەم دەکەیت یا وەسف. معاویە وتی: بەخواستی خوا وەسفت دەکەین.

موغەیرە فەرمانداری کوفەی گرتە دەست و باشترین شێوازی گرتەبەر جگە لەوەی جویندان و سەرکۆنە کردنی عەلی و پاڕانەوە لەخوا بۆ عوسمانی پشت گوێ نەدەخست. کاتێك حوجر کوڕی عودەی ئەمەی بیست، دەیوت: خواوەند سەرکۆنەی ئێوەی کردوە و بەنا فرەتی کردون! دواتر هەڵدەستا و دەیوت: شایەتی دەدەم کە، ئەو کەسەی سەرکۆنەی دەکەن شیاوترە بۆ وەسف کردن و ئەوەی وەسفی دەکەن شیاوترە بۆ سەرکۆنە کردن. موغەیرە پێی وت: ئەی حوجر، لەتوڕەیی و رقی ئەم پاشایە بترسە. توڕەیی پاشا کەسانی وەك تۆ بەرەو هەڵدێری لەناوچون دەبات. دواتر دەستی لێ هەڵدەگرت و دەیبەخشی.

کاتێك موغەیرە گەیشتە کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی خۆی، دوبارە سەبارەت بەعەلی و عوسمان قسەکانی هێنایەوە سەر زمان. حوجر هەستا و بەشێوەیەك بەسەر موغەیەرەدا قیژاندی کەهەمو دانیشتوانی مزگەوت بیستیان. پێی وت: ئەی پیاو، فەرمان بدە رۆژیەکانمان بۆ بگەڕێننەوە کەلێتان زەوت کردوین بێ ئەوەی بتوانی ئەوکارە بکەیت چونکە تۆ توانایی ئەوەت نیە ئەم خراپە کاریە ئەنجام بدەیت. تۆ دڵت بەسەرکۆنە کردنی عەلی خۆش کردوە و لەگەڵ ئەم کارە ناجوامێرانە بویتە هاودەم. دو لەسەر سێی کەسەکانی ناو مزگەوت هەستان و پشتیوانیان لەحوجر کرد و بەردەوام دەیانوت: حوجر راستی کرد و راستی نیشاندا. فەرمان بدە رۆژیەکانمان بۆ بگەڕێنەوە چونکە ئەوەی تۆ دەیکەیت، هیچ سودێك بەئێمە نابەخشێت. زۆریان وت و زۆریان باس کرد. موغەیرە لەسەر تەختی وتاردان هاتەخوار و کەسەکانی لێی نزیك بونەوە و وتیان. بۆ ئەم پیاوە پشت گوێ دەخەیت تا لەسنوری فەرمانڕەوایەتی تۆ بەمشێوەیە بوێری لەخۆی نیشان بدات وئەم قسانە بێنێتە سەر زمان و فەرمانڕەوایی تۆ لاواز و سست بکات و سەروەری باوەڕداران لەتۆ تورە بکات. موغەیرە وتی: من ئەوم بەکوشتن دا. دوای من فەرمانڕەوایەك دێت کەهاوشێوەی من دژایەتی ئەو دەکات و بەڵایەکی بەسەر دێنێت کەدەیبینن، دەیگرێت و دەیکوژێت! من لەکۆتایی فەرمانڕەوایەتیدام و نامەوێت باشترین پیاوەکانی ئەم شارە کوشتار بکەم تا بەدبەخت ببم و ئەوان بەختەوەر. معاویە لەم دنیا خۆش رابوێرێت و موغەیەرە لەو دنیا لەکۆتاییەکانی جەهەننەمدا بێت.

دواتر موغەیرە کرد و زیاد کوڕی ئوبیە هاتە سەر کار. زیاد هاتە کوفە و وتارێکی پێش کەش کرد و خۆشەویستی بۆ عوسمان نیشاندا و هاورێکانی وەسف کرد و لۆمەی بکوژەکانی کرد. حوجر هەستا و هەمان کاری کرد کە لەسەردەمی موغەیرە دەیکرد. زیاد بۆ بەسرە گەڕایەوە و عەمرۆ کوڕی حورەیسی وەك جێگری خۆی لەکوفە دانا. ئەویان ئاگادار کردەوە کە لایەنگرانی عەلی لای حوجر کوڕی عودەی کۆدەبنەوە و بەئاشکرا نفرینی معاویە دەکەن و بێزاری خۆیان دەردەبڕن. هەروەها وتیان کەئەوان عەمرۆ کوڕی حورەیسیان بەردباران کردوە. زیاد لەبەسرە هاتەدەر و ئاهەنگی کوفەی کرد. لەسەر تەختی وتاردان دانیشت و سوپاسی خوای بەجێهێنا و حوجر لەوێ

دانیشتبو. دواتر وتی: چاڵی ستەمکاری وگومڕایی مەرگ هێنەرە. ئەوانە کۆبونەتەوە و سەرخۆش بون. لەمن بێ خەم بون و ڕێگەی بێ شەرمیان گرتۆتەبەر وز شەڕیان لەگەڵ خوا دەست پێکردوە. ئەگەر دەست بەرداری کارەکانتان نەبن، ئێوە بەهەڵسەنگاندان و داوەری خۆتان چارەسەر دەکەم. من هیچ نیم ئەگەر کوفە لەحوجر و هاوڕێکانی نەپارێزم و ئەیکەمە وانەیەك بۆ داهاتوان. ئەی حوجر، هاوار لەدایکت، ئێوارێ تۆی بەرەو گورگەکە برد (ئاماژەیە بەداستانێکی عەرەبی: یانی ئێواران ئەوەی بەرەو لای گورگەکە برد).

ئەو کەسی بەدوای حوجردا رەوانە کرد و بۆ مزگەوتی بانگ کرد. کاتێك نێردراوەکەی زیاد گەیشت، هاوڕێیانی حوجر وتیان: مەڕۆ، خوا بەرێزی نەکات. نێردراوەکەی زیاد گەڕایەوە و ئاگاداری کردەوە. زیاد بەسەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی شەداد کوڕی هەیسەمی وت بۆ هێنانی زیاد دەستەیەك رەوانە بکات. ئەو ئەم کارەی کرد و حوجر جوێنی پێدان. ئەوان گەڕانەوە و زیادیان ئاگادار کردەوە. زیاد خەڵکانی کوفەی کۆکردەوە و وتی: بەدەستێك سەر دەشکێنن و بەدەستەکەیتر تیمار دەکەن! جەستەتان لەگەڵ منە و دڵتان لەگەڵ حوجری نەزان! سوێند بەخوا ئەمە لەخراپەکاری ئێوەیە. سوێند بەخوا یا دەبێت بێ گوناحی ئێوە بێ چەند و چون بۆ من ئاشکرا ببێت یا بێ هیچ گومانێك خەڵکێك دەکەمە فەرمانڕەوایی ئێوە تا ناراستی وگەردن درێژی ئێوە راست بکەنەوە. وتیان: پەنا بەخوا ئەگەر ئەندێشەیەك جگە لەفەرمانبردن و رەزامەندی تۆمان لەسەردا بێت. وتی: دەبێت یەك یەکی ئێوە هەستێت و هەر کەسێك لەخەڵك و هۆزەکەی خۆی کەلەناو هاوڕێیانی حوجردایە، بۆ ئێرە بێنێت. ئەوان هەستان و زۆرینەی هاوڕێیان و یارانی حوجریان لەدەوری ئەو بڵاو کردەوە. زیاد کوڕی ئوبیە بەسەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی وت: برۆ لای حوجر، ئەگەر فەرمانبرداری تۆی کرد، بیهێنە بۆ لای من و گەرنە بەشمشێر هێرشیان بکەنەسەر تا لێرە کۆیان بکەنەوە.

سەرکردەی پاسەوانەکان هات و داوای لەحوجر کرد لەگەڵی بڕوات. هاوڕێکانی پارێزگاریان لێکرد رێگەیان نەدا داواکاریەکەی زیاد بەجێبێنێت. ئەبوعومەر طە کێندی بەحوجری وت: لەناو هاوڕێکانی تۆ تەنیا من شمشێرم هەیە و ئەم شمشێرە

بەتەنیایی ناتوانێت هیچ کارێك بکات. هەستە و پەیوەستی خەڵکەکەی خۆت بە تا پارێزگاریت لێ بکەن. زیاد لەسەر تەختی وتاردان بو و چاوەروانی ئەوانی دەکرد. هاورێیانی زیاد گەمارۆیاندان. پیاوێك لەخەڵکی حەمرا گورزێکی لەسەری عەمرۆ کوڕی حەمیق دا و کەوتە سەرزەوی. هاورێکانی هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆ ناو خەڵکانی ئەزد و لەناو ئەوان خۆی شاردەوە و دواتر هاتەدەر. هاورێیانی حوجر رویان کردە دەزوازەکانی کێندە. یەکێك لەپاسەوانەکان بەشمشێر لەدەستی عایز کوڕی حەملەی دا و جیاواز لەوە بەمشت لەدیانەکانی پێشەوەی دا و خستیە سەر زەوی. عایز کوڕی حەملە گورزی یەکێك لەپاسەوانەکانی هەڵگرت و شەڕی دەست پێکرد و پارێزگاری لەحوجر و هاورێکانی دیکەی کرد تا لەدەروازەکانی خەڵکی کێندە رۆشتنەدەر. حوجر بەرەو وشترەکەی خۆی رایکرد. ئەبوعومەر طە پێی وت: سوار بە کەخۆت و ئێمەت بەکوشتندا. ئەوی هەڵگرت و سواری کرد و ئەبوعومەر سوار ئەسپەکەی خۆی بو. یەزید کوڕی تورەیفی موسلی خۆی پێگەیاند و گورزێکی لەرانیدا. ئەبو عومەر شمشێرەکەی بەرز کردەوە و لەسەریدا کەکەوتە سەر زەوی. دواتر باش بویەوە. سەبارەت بەوە کە عەبدالله کوڕی هەمامی سەلوولی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| الوم بن لوم ما عدابك حاسرا | الی بطل ذی جراة و شکیم |
| معاود ضرب الدارعین بسیفه | علی الهام عند الروع غیر لئیم |
| الی فارس الغرین یوم تلاقیا | بصفین قرم خیر نجل قروم |
| حسبت ابن برصاء الحتار قتاله | فتالك زیدا یوم دار حکیم |

یانی: ئەو پەستی کوڕی پەستە، تۆی بەسەری رووت بەجێهێشت؟ هێرشی کردە سەر پاڵەوانێکی وەك تۆ، پاڵەوانێکی بوێر کەبێداد راو دەنێت و دوری دەخاتەوە. ئەوەی بەردەوام هێرشی دەکردە سەر زرێ پۆشەکان و شمشێری لەتەوقە سەری ئەوان دەدا و هیچ کات لەکاتی شەڕدا پەستی لەخۆی نیشان نەدەدا. هێرشیان کردە سەر پاڵەوانێکی وەك تۆ کە گەورە سواری هەر دو سوپا بویت و لەشەڕی صەفین بەپاڵەوانی پاڵەوانەکان ناسرایت. ئەی کوڕی (برصط الحتار) ئایا شەڕ کردن لەگەڵ ئەو وەك شەڕ لەگەڵ زەید لەرۆژی شەڕی (داری حەکیم) هاتەبەرچاوت؟

ئەم شمشێرە یەکەم شمشێر بو لەکوفە لەشەڕی نێوان خەڵکانی کوفە بەرز کرایەوە.

حوجر و ئەبوعومەر، ڕۆشتنە ماڵی حوجر و خەڵکانێکی زۆر لەدەوری ئەوان کۆبونەوە. لەوخەڵکانی کێندە زیاتر لەچەند کەسێك نەهاتە لای. زیاد بەهەمان شێوە کەسەر تەختی وتاردان بو، مەزحەجیەکان و خەڵکانی هەمەدانی بۆ دەشتی کێندیەکان رەوانە کرد تا حوجری بۆ بێنن و خەڵکانی یەمەنی بۆ دەشتی صایدین رەوانە کرد و فەرمانی پێدان بڕۆنە لای هاوڕێ نزیکەکەی حوجر و بیهێنن. ئەو کارەیان کرد. مەزجەحیەکان و هەمەدانیەکان ڕۆشتنە دەشتی کێندە و هەر کەسێکیان بینی هێنایان. زیاد سوپاس و وەسفی کردن.

کاتێك حوجر زانی هاورێکانی کەمن، فەرمانی گەڕانەوەی پێدان. پێی وتن: ئێوە توانایی خۆراگرتنتان نیە لەبەردەم هەمو ئەو کەسانەی لەسەر سەری ئێوە کۆبونەتەوە و من هەرگیز خوازیاری لەناوچونی ئێوە نیم. ئەوان ڕۆشتن. مەزجەحیەکان و هەمەدانیەکان شوێنیان کەوتن و شەڕیان لەگەڵ کردن و یەزید کوڕی قەیسیان گرفتار کرد و کەسانی دیکە رزگاریان بو. حوجر کوڕی عودەی رێگەی بەنی حوتی گرتەبەر و ڕۆشتە ماڵی پیاوێك لەوان بەناوی سولەیم کوڕی یەزید. ئەوانەی شوێنی کەوتبون، خۆیان پێ گەیاند و سولەیم شمشێرەکەی خۆی هەڵگرت تا شەڕ دەست پێ بکات. کچەکانی دەستیان بەگریان کرد. حوجر وتی: ئێستا زانیم بەڵایەکی زۆر خراپم بەسەر کچەکانی تۆ هێناوە. سولەیم وتی: سوێند بەخوا تا زیندوبم رێگە نادەم تۆ بەزیندویی بگرن یا بتکوژن. حوجەر لەپەنجەرەی ماڵەکەیەوە ڕۆشتەدەر و بەرەو نەخەعیەکان بەرێکەوت و لای عەبدالله کوڕی حارس برای مالکی ئەشتەر دابەزی. ئەو بەخێرهاتنی حوجری کرد. لەم کاتەدا کەلای عەبداڵلە بو، لەناکاو پێیان وت کەپاسەوانەکان لەناو خەڵکانی نەخەع بەدوای تۆدا دەگەرێن چونکە کەنیزێك چاوی بەسوپاکە کەوتوە و لێی پرسیون بەدوای کێدا دەگەرێن؟ وتویانە: حوجر کوڕی عودەی. وتویەتی: لەناو خەڵکی نەخەعدایە.

حوجر هاتەدەر و بەرەو خەڵکانی ئەزد بەرێکەوت و لای رەبیعە کوڕی ناجد خۆی شاردەوە.

کاتێك لەدۆزینەوەی ئەو بێزار و ناتەوان بون، زیاد کوڕی ئوبیە محەممەد کوڕی

ئەشعەسی بانگ کرد و پێی وت: سوێند بەخوا بێ چەند و چون حوجر دەهێنی بۆ لای من وگەرنە بێ هیچ گومانێك هەمو دارخورماکانی تۆ دەبڕم و ماڵەکەت وێران و لەدەستم رزگارت نابێت تا لەت لەتت دەکەم. محەممەد کوڕی ئەشعەس داوای مۆڵەتی لێکرد و زیاد سێ رۆژ مۆڵەتی پێدا و قەیس کوڕی یەزیدی بانگ کرد کەئەسیر بو. زیاد پێی وت: تۆ ترست لەسەر نیە، ئەندێشەی تۆم سەبارەت بەعوسمان دەزانی و ئاگادار بوم کە لەشەڕی صەفین بۆ بەرژەوەندی معاویە شەڕت کردوە. تۆ لەبەر ئەوە هاوکاری حوجرت کرد تا هاوکاری پەنابەرەکەی خۆتت کردبێت. تۆ دەبەخشم بەلاّم براکەت عومەیر کوڕی یەزید بێنە بۆ لای من. قەیس بۆ گیان و سامانی براکەی داوای ئەمانی کرد و زیاد ئەمانی پێ بەخشی. ئەو براکەی هێنا کەبریندار بو. زیاد فەرمانی بەپاسەوانەکاندا و زنجیری ئاسنینی قورسیان کردە دەست وپێی و بەردەوام بەرزیان دەکردەوە و دەیانکێشا بەزەویدا. قەیس کوڕی یەزید بەزیادی وت: ئایا ئەمانت پێ نەبەخشی؟ زیاد وتی: بەڵێ، ئەمانم پێ بەخشی و خوێنی ناڕێژم. دواتر بەڵێنی لێ وەرگرت و ئازادی کرد.

حوجر کوڕی عودەی شەو ورۆژێك لەماڵی رەبیعە مایەوە و دواتر کەسێکی بۆ لای محەممەد کوڕی ئەشعەس رەوانە کرد و داوای لێکرد تا لەزیاد ئەمانی بۆ وەربگرێت و بۆ لای معاویەی رەوانە بکات. محەممەد دەستەیەکی کۆکردەوە و لەناو ئەوان: جەریر کوڕی عەبداللە، حوجر کوڕی یەزید، عەبداللە کوڕی حارس برای مالکی ئەشتەر و کەسانیتر. ئەوان ڕۆشتنە لای زیاد و داوای ئەمانی حوجریان لێکرد لەسەر ئەو بنەمایی کەرەوانەی لای معاویەی بکات. زیاد رازی بو. کەسیان بەدوای حوجردا رەوانە کرد و ئەوی لای زیاد ئامادە بو. کاتێك ئەوی بینی، وتی: ئافەرین لەتۆ ئەی باوکی عەبدولرەحمان! شەر لەکاتی شەڕ و جەنگ لەکاتێك خەڵك باوەشیان بۆ ئاشتی کردۆتەوە. حوجر وتی: نە لەفەرمانبردن ملکەچیم کردوە و نە لەرێگەی خەڵکان خۆم دورخستۆتەوە و لەسەر بەیعەتەکەی خۆم ماوم. زیاد فەرمانیدا و ئەویان خستە زیندانەوە. کاتێك حوجر کوڕی عودەی پشتی تێکرد و بەرێکەوت، زیاد وتی: سوێند بەخوا ئارەزومە، خوێنی بڕێژم! زیاد کوڕی ئوبیە دەستی بەگەڕان بەدوای هاورێیانی حوجر کرد. عەمرۆ کوڕی حەمیق بەرێکەوت تا گەیشتە موسڵ و ریفاعە کوڕی شەداد

هاورێیەتی دەکرد. هەواڵی ئەم دوانە بەفەرمانداری موسڵ گەیشت. بەرەو لای ئەو دوانە بەرێکەوت و ئەوانیش بەهەمان شێوە. عەمرۆ سکی ئاوی کردبو و نەیدەتوانی بەرگری لەخۆی بکات. بەڵام ریفاعە، گەنجێکی بەهێز و چوارشانە بو. سوار ئەسپەکەی خۆی بو تا بۆ رزگار کردنی عەمرۆ شەڕ دەست پێ بکات. عەمرۆ کوڕی حەمیق پێی وت: بەرگری کردنی تۆ لەمن، چ سودێکی بۆ من هەیە؟ خۆت رزگار بکە. ئەو هێرشی کردە سەر ئەوان و بڵاوەی پێکردن و خۆی رزگار کرد. عەمرۆ گرفتار کرا. پێیان کێیت؟ وتی: کەسێك کە ئەگەری رزگاری بکەن باشترە بۆتان و ئەگەر بیکوژن زیانبار دەبێت بۆتان. ئەوانی ئاگادار نەکردەوە. ئەویان بۆلای فەرمانداری موسڵ عەبدولرەحمان کوڕی عوسمانی سەقەفی ناسراو بەناوی (کوڕی دایکی حەکەم) رەوانە کرد. ئەوی ناسی و معاویەی ئاگادار کردەوە. معاویە نوسی: ئەو گومان دەکات تیرێکی نۆجار لەجەستەی عوسمان چەقاندوە. بەتیرێکی هاوشێوەی تیرەکەی خۆی بیکوژن. بردیانەدەر و لەلێدانی یەکەم یا دوەمی تیرەکە مرد.

زیاد کوڕی ئوبیە بۆ دۆزینەوەی هاورێکانی حوجر هەوڵی دەدا و ئەوان بۆ هەر سوچ و قوژبنێك بڵاوەیان لێکرد. هەر کەسێکی دەست کەوت، گرفتاری کرد. قەبیصە کوڕی زوبەیعەی عەبسی ئەمان پێدراویان بردە لای کەفەرمانیدا و خستیانە زیندانەوە. قەیس کوڕی عوبادی شەیبانی رۆشتە لای زیاد و وتی: لەناو ئێمەدا پیاوێك بەناوی صەیفی لەهاورێ دیارەکانی حوجر کوڕی عودەیە. زیاد کەسی بەدوای ئەودا روانە کرد و هێنایان. پێی وت: ئەی دوژمنی خوا، سەبارەت بەئەبو توراب چی دەڵێیت؟ صەیفی وتی: ئەبو توراب ناناسم. زیاد وتی: جوان دەیناسیت. ئایا عەلی کوڕی ئەبی تالب ناناسیت؟ وتی: بەڵێ دەیناسم. وتی: ئەو ئەبو تورابە. صەیفی وتی: هەرگیز، ئەو باوکی حەسەن و حسینە. سەرکردەی پاسەوانەکانە وتی: فەرماندار دەڵێت: ئەبو توراب و تۆ دەڵێی نا! صەیفی وتی: ئەگەر ئەمیر درۆ بکات، منیش درۆ دەکەم و شایەتی ناڕەوا دەدەم وەك ئەو؟ زیاد وتی: ئەمیش. داردەستەکەم بۆ بێنن. بۆیان هێنا. زیاد پرسی: سەبارەت بەعەلی چی دەڵێیت؟ صەیفی وتی: باشترین وتار. زیاد وتی: لێی دەن. ئەوەندەیان لێدا تا بەزەویەوە لکا. دواتر وتی: دەستی لێ هەڵگرن. سەبارەت بەعەلی چی دەڵێیت؟ وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بەکێرد لەت لەتم بکەن، جگە لەوەی

بیستت، هیچ سەبارەت بەعەلی ناهێنمە سەر زمان. زیاد وتی: یا نفرینی بکە یا دەتکوژم. وتی: نایکەم. زنجیرێکی ئاسنینی قورسیان هێنا و لەزنجیریان کرد و خستیانە زیندانەوە.

دەستەیەك دەڵێن: قەیس کوڕی عوباد زیندو مایەوە تا لەهەمو شەڕەکان بۆ هاوکاری کوڕی ئەشعەس بەشداری کرد. دواتر ڕۆشتە کوفە و خانەنشین بو. حەوشب بەحەجاجی وت: لێرە پیاوێکی ئاژاوەگێری لێیە کە هیچ ئاژاوەیەك لەعێراق هەڵنەگیرساوە مەگەر ئەوەی دەستی ئەمی تیا بێت. ئەو لەلایەنگرانی عەلیە و نفرینی عوسمان دەکات. لەگەڵ کوڕی ئەشعەس شۆڕشیان دەست پێکردوە تا ئەو لەناوچوە. ئێستا گەڕاوەتە بۆ شار و خانەنشین بوە. حەجاج چەندین کەسی نارد و ئەویان کوشت. بنەماڵەکەی بەبنەماڵەی حەوشبیان وت: بۆ زیانی هاورێکەی ئێمە زمانتان بۆ قسە کردەوە! ئەوان وەڵامیان دانەوە: ئێوەیش بۆ زیانی هاورێکەی ئێمە ئەو کارەتان کرد، مەبەستیان صەیفی شەیبانی بو.

زیاد کەسێکی بەدوای عەبداللە کوڕی خەلیفەی تایی ڕەوانە کرد و ئەو ئاوارە بو و خۆی داشارد. پاسەوانەکانی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد و ئەسیریان کرد. خوشکەکەی یانی ئەوار، خەڵکانی تەی هاندا کە هێرشیان کردە سەر پاسەوانەکان و ڕزگاریان کرد. بۆ لای زیاد گەڕانەوە و لەڕوداوەکە ئاگاداری کردەوە. ئەو عودەی کوڕی حاتەمی لەمزگەوت گرت و خستیە زیندانەوە و پێی وت: عەبداللە بێنەرە لای من. عودەی پرسی: چ کارمیە؟ زیاد ئاگاداری کردەوە. عودەی وتی: ئاگادار نیم؟ زیاد وتی: دەبێت ئەو بێنیتە لای من. عودەی وتی: سوێند بەخوا هەرگیز ئەو ناهێنمە لای تۆ. کوڕە مامەکەم بێنم تا بیکوژیت! سوێند بەخوا ئەگەر لەژێر قاچم بوایە، قاچم هەڵنەدەگرت! زیاد فەرمانیدا و عودەیان خستە زیندانەوە. هیچ کەس لەخەڵکانی یەمەن و ڕێبعی نەمایەوە مەگەر ئەوەی بۆ ئازاد کردنی عودەی نێوەنجیگەری کرد. هەمویان دەیانوت: لەگەڵ عودەی کوڕی حاتەم هاورێی بەڕێزی پێغەمبەر ئەم کارە دەکەیت. وتی: ئەو لەزیندان ڕزگار دەکەم لەسەر ئەو بنەمای کە کوڕە مامەکەی بێنێتە[١] لای من و تا ئەو کاتەی من فەرمانداری ئەم شارە بم، ڕو نەکاتە ئێرە. ئەوان ڕازی بون. عودەی کەسی بۆ لای عەبداللە ڕەوانە کرد و لەڕوداوەکە ئاگاداری کردەوە و

فەرمانی پێدا بۆ دو کوێستانی تەی بڕوات. عەبدالله بەرەو ئەو دیارە رایکرد. ئەو بەردەوام نامەی بۆ عودەی دەنوسی تا نێوەنجیگەری بکات و بۆ کوفە بگەڕێتەوە. عودەی بەردەوام موژدەی پێ دەدا و دڵخۆشی دەکرد. لەناو ئەو شتانەی بۆی نارد و ئەوی سەرکۆنە کرد و پرسەی بۆ حوجر و هاورێکانی گێڕا، ئەم قەسیدەیە:

تذكرت ليلى و الشبيبة اعصرا          و ذكر الصبا برح على من تذكرا
و و لى الشباب فافتقدت غصونه          فيالك من وجد به حين ادبرا
فدع عنك تذكار الشباب و فقده          و اسبابه انبان عنك فاضمرا
و بك على الخلان لما تخرموا          و لم يجدوا عن منهل الموت مصدرا
دعتهم مناياهم و من حان يومه          من الناس فاعلم انه لن يوخرا
اولئك كانوا شيعة لى و موئلا          اذا اليوم الفى ذا احتدام مذكرا
و ما كنت اهوى بعدهم متعللا          بشىء من الدنيا و لا ان اعمرا
اقوا و لا و الله انسى ادكارهم          سجيس الليالى او اموت فاقبرا
على اهل عذراء السلام مضاعفا          من الله و ليسق الغمام الكنهورا
و لاقى بها حجر من الله رحمة          فقد كان ارضى الله حجر و اعذرا
و لا زال تهطال ملث و ديمة          على قبر حجر او ينادى فيحشرا
فيا حجر من للخيل تدمى نحورها          و للملك المغزى اذا ما تغشمرا
و من صادع بالحق بعدك ناطق          بتقوى و من ان قيل بالجور غيرا
فنعم اخو الاسلام كنت و اننى          لا طمع ان توتى الحلود و تحبرا
و قد كنت تعطى السيف فى الحرب حقه          و تعرف معروفا و تنكر منكرا
فيا اخوينا من هميم عصمتما          و يسرتما للصالحات فابشرا
و يا اخوي الخندفيين ابشرا          بما معنا حييتما ان تبترا
و يا اخوتا من حضرموت و غالب          و شيبان لقيتم حسابا ميسرا
سعدتم فلم اسمع باصوب منكم          حجاجا لدى الموت الجليل و اصبرا
سابكيكم ما لاح نجم و غرد الـ          ـحمام ببطن الواديين و قرقرا
فقلت و لم اظلم: اغوث بن طىء          متى كنت اخشى بينكم ان اسيرا
هبلتم الا قاتلتم عن اخيكم          و قددت حتى مال ثم تجورا

تفرجتم عنى فغودرت مسلما — كانى غريب من اباد و اعصرا

فمن لكم مثلى اذا الحرب قلصت — و اوضع فيها المستميت و شمرا

فها انا ذا أوى باجبال طىء — طريدا فلوشاء الاله لغيرا

نفانى عدوى ظالما عن مهاجرى — رضيت بماشاء الاله و قدرا

و اسلمنى قومى بغير جناية — كان لم يكونوا لى قبيلا و معشرا

فان الف فى الدار باجبال طىء — و كان معانا من عصير و محضرا

فما كنت اخشى ان ارى متغربا — لحى الله من لاحى عليه و كثرا

لحر الله قيل الحضرميين وائلا — و لاقى القنانى بالسنان المومرا

و لاقى الردى القوم الذين تحزبوا — علينا و قالوا قول زور و منكرا

فلا يدعنى قوم لغوث بن طىء — لئن دهرهم اشفى بهم و تغيرا

فلم اغزهم فى الملمين و لم اثر — عليهم عجاجا بالكويفة اكدرا

فبلغ خليلى ان رحلت مشرقا — جديلة و الحيين معنا و بحترا

و نبهان و الافناء من جذم طىء — الك اك فيكم ذا الغناء العشنذرا

الم تذكروا يوم العذيب أليتى — امامكم ان لا ارى الدهر مدبرا

و كرى على مهران و الجمع حابس — و قتلى الهمام المستميت المسورا

و يوم جلولاء الوقيعة لم الم — و يوم نهاوند الفتوح و تسترا

و تنسوني يوم الشريعة و القنا — بصفين قى اكتفقهم قد تكسرا

جزى ربه عنى عدى بن حاتم — برفضى قو خذلانى جزاء موفرا

اتنسى بلائى سادرا يابن حاتم — عشية ما اغنت عديك حزمرا

فدافعت عنك القوم حتى تخاذلوا — و كنت انا الخصم الا لد العذوراء

تولوا و ما قاموا مقامى كانما — رأونى ليثا بالاباءة مخدرا

نصرتك اذخان القريب و ابعط الـ — ـبعيد و قد افردت نصرا مؤزرا

فكان جزائى ان اجرر بينكم — سحيبا و ان اولى الهوان و اوسرا

زكم عدة لى منك انك راجعى — فلم تغن بالميعاد عنى حبترا

فاصبحت ارعى النيب طورا و تارة — اهرهران راعى الشويهات هرهرا

كانى لم اركب جوادا لغارة — و لم اترك القرن الكمى مقطرا

و لم اعترض بالسيف منكم مغيرة    اذ النكس مشى القهقرى ثم جرجرا

ولم استحث الركب فى اثر عصبة    ميممة عليا سجاس و ابهرا

و لم اذعر الابلام منى بغارة    كورد القطا ثم انحدرت مظفرا

ولم ارفى خيا تطاعن مثلها    بقزوين او شروين او اغركيدرا

فذالكدهر زال عنك حميده    و اصبح لى معروفه قد تنكرا

فلا يبعدن قومى و ان كنت عاتبا    و كنت المضاع فيهم و المكفرا

ولاخير فى الدنيا و لاعيش بعدهم    و ان كنت عنهم نائى الدار محصرا

یانی: گەنجی و رۆژگاری دڵداریم لەگەڵ لەیلا بیرهێنایەوە و خۆم دەزانم بیرکردنەوەی شەیدایی، بۆ هەر کەسێك بیری بێنێتەوە، زیانێکی گیانبڕ هەژمار دەکرێت. گەنجی ڕۆشت و لقەکانی لەچاودا سیس و ژاکان. چ داغێك لەسەر دڵ بەجێ دێڵێت ئەو کاتەی پشتت تێدەکات و بۆ دواوە دەڕوات. بیرکردنەوەی گەنجی و لەناوچونی بەندەکانی پەیوەست بون لەبیر بکە چونکە لەتۆ دور کەوتۆتەوە و بەخێرایی بەرەو لەناوچون دەروات. بۆ ئەو هاورێیانە خوێن ببارێنە کەفەوتان. رۆشتنە سەر کانیاوی مەرگ و رێگەی هاتنەدەرەوەیان دەست نەکەوت. مەرگی ئەوان بۆ لای خۆی بانگێشتی کردن، هەر کەس لەخەڵکان رۆژی بگات، بزانە چیتر مۆڵەتی پێنادەن. ئەوان لایەنگران و پشت و پەنای من بون. ئێستا ئەو رۆژە گەیشت کەتەنیا بیرم دەکرێتەوە. دوای ئەوان هیچ کات دڵی خۆشم لەم جیهانە نەویست و ئارەزویشم نەکرد تەمەنم درێژ ببێتەوە. دەڵێم ( و سوێند بەخوا هەرچەند تێپەڕینی شەو رۆژ بەهەمیشەیی پەیوەست دەبێت و مەرگی من دەگات و لەناو گۆڕ لەهەر چاو و دڵێك پاك دەبمەوە، ئەوانم لەبیر ناچێت). هەزاران سڵاوی خوایی لەدانیشتوانی ئەو شارە بێت و لەخوام دەوێت هەورێکی بارانزا بارانیان بۆ ببارێنێت. لەوێ حوجر کوڕی عودەی باوەشی بەخۆشەویستی خوادا کرد. حوجر خوای رازی کرد و هیچ بیانوێکی نەهێشتەوە. بەردەوام باران لەسەر گۆڕەکەی ببارێت. بەم شێوە بێت تا ئەو کاتەی بانگی دەکەن و بەرەو بیابانی هەستانەوەی دەبەن. ئەی حوجر، کێیە باڵ و سینەی ئەسپی دوژمنان غەڵتانی خوێن بکات. کێیە لەگەڵ پاشای دڕندەی تەیار شەڕ بکات؟ کام وتاردەرمیە دوای تۆ وتەیەکی خۆپارێزانە بێنێتە سەر زمان و راستی و دروستی ئاشکرا بکات و

ئەگەر ستەم بکەن، ژێر و  روو بێت؟ خۆزگەم بەبرایەکی دینی کەتۆ بویت، بەردەوام ئارەزوم دەکرد پەیوەستی ئەمری بیت و شادمان بیت و بەهەشت برازێنیتەوە. تۆ ئەو کەسە بویت بۆ شەڕی حەق شمشێرت دەردەکێشا، خەڵکت بۆ چاکە بانگ دەکرد و لەخراپە دورت دەخستنەوە. ئێستا ئەی دوبراکەی من لەهومام، خۆڕاگر بن، بۆ چاکیەکان ئامادە بن و چاوەڕوانی مژدەی کۆتایی چاکە بن. ئەی دو هاوڕێی خەندەف نەژادی من، مژدەتان لێ بێت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێمە هەتانە. سڵاو لەئێوە بێت و هیوادارم هیچ کات پەیوەندیتان لەگەڵ ئێمە نەپچڕێت. ئەی براکانی من لەحەزرموت و غالب و شیبان. بەختەوەر بون و لەبەرابەر مەرگێکی مەترسیدار کەسم بوێرتر لەئێوە نەدی. تا ئەو کاتەی ئەستێرەیەك لەئاسمان بدرەوشێتەوە و کۆترێك لەنێوان ئەم دو دۆڵەدا بجریوێنێت، بەخوڕ بۆ ئێوە دەگریم. وتم ( و زۆرم ئەوت): ئەی کوڕی تەی، من کەی لەوە ترساوم لەئێوەم دور بخەنەوە؟ دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت. ئایا بۆ بەرگریکردن لەبراکەتان شەرم نەکرد؟ ئەو رۆژەتان بیر نیە کەتای گرت و لاواز بو و دواتر کەوت؟ لەدەوری من بلاوەتان لێکرد و من رادەستی دوژمنان کرام وەك بڵێی بێگانەیەك لەخەڵکانی ئەیاد و ئەعصەر بوم؟ کێیە لەهەر شەڕێك لەکاتی هێرش بردن وەك من لەگەڵتانا بێت؟ کێیە بۆ ئێوە کاتێك شەڕ روخساری قێزەونی خۆی نیشان بدات، پیاوانە شەڕ دەست پێ بکات؟ کێیە کاتێك شەڕ خێرا و بەردەوام بێت و دەستە شەڕکەرەکان خۆیان تەیار بکەن و تەقە لەدەرگای مەرگ بدەن، وەك من پشتیوانی ئێوە بێت.؟ ئێستا من ئەو کەسەم پەنام بۆ کوێستانەکانی تەی هێناوە، ئاوارەم و دڵم بەوە خۆشە ئەگەر خوا بیەوێت، بارودۆخ بگۆڕێت. دوژمنی من بێ بەزەییانە منی لەشوێنەکەم دەرپەڕاند و من بەوەی ئارەزو و ویستی خوای لەسەرە، رازی بوم. خەڵکان بێ ئەوەی گوناحێکم کردبێت، لەدەورم بلاوەیان لێکرد و منیان بەدوژمنان سپارد، وەك بڵێی هیچ کات لەتایەفە و نەژادی من نەبون. ئەگەر لەماڵێك لەکوێستانەکانی تەی بدۆزرێمەوە، پەناگە و ئاو و رۆژگار کەی لەئارادا دەبێت. هیچ کات لەوە نەترساوم بێ کەس و کار ببینرێم. خوا ئەو کەسە ریسوا بکات ئەوی دور خستەوە و تەنیای خست. خوا سەرکردەی حەزرەمیەکان ریسوا بکات، وایل ریسوا بکات و ڕمێکی تیژ لەسینەی قەنانیەکان بچەقێنێت. خۆزگە روبەروی مەرگ و نەمان ببنەوە ئەوانەی

لەبەرابەر ئێمە کوبونەوە و زۆر و ستەمیان کرد. نەبا خەڵکانی داوای هاوکاریم لێ بکەن بۆ غوص کوڕی تەی ئەگەر رۆژگار ریسوایان بکات و بارودۆخیان بگۆڕێت. مەگەر من نەبوم لەدو گۆڕەپان شەڕم لەگەڵ کردن؟ لەو شارە یانی کوفە خۆڵی ڕەشم بەسەردا پرژاندن؟ ئەگەر بەرەو رۆژهەلاّت کۆچت دەکرد و تیرەکانی مەعن بوحتور و جەدیلە و نەبهان و بێ ناو و نیشانەکانت لەنەژادی تەی ت بینی، ئەم پەیامە بگەیێنە: مەگەر من لەناو ئێوە بەتوانایەکی ریسزداری روخۆش نەبوم؟ ئایا سوێندی منتان لەشەڕی عوزەیب بیر نیە کە لەبەردەم هەموتان وتم: هەرگیز هیچ بینەرێك من نابێت پشتم لەدوژمن بێت؟ هێرشی من بۆ سەر مێهرانتان نەبینی کاتێك سوپا لەگەمارۆی شەڕدا گرفتار ببو، ئەو رۆژەی کە ئەو پاڵەوانە مەرگ هێنەرەی کە دەسبەندێکی زێڕینی بەستبو، لەخاك و خوێندا گەوزاندم؟ لەشەڕەکانی جەلەولا و نەهاوەند و گرتنی شوشتەر، کەس رەخنەی لەمن نەگرت. منتان لەشەڕی صەفین لەبیر بردۆتەوە کە لەو کاتە دژوارەدا، داری ڕمەکانم لەشانی شەڕکەراندا شکاندبو. خوا لەجیاتی من عودەی کوڕی حاتەم سزا بدات کەمنی لەبیربردەوە و منی لەخۆی دورخستەوە و بەتەنیایی هێشتم. ئەی کوڕی حاتەم، ئایا ئەزمونی بوێری منت لەبیر کردوە کەئازایانە شەڕم دەکرد؟ ئەو ئێوارێ بیر بێنەرەوە کەعودەی کوڕی تۆ نەیتوانی لەبەرابەر حزمێر هیچ کارێك بکات. شەڕکەرانم لەتۆ دورکردەوە تا ئەو جێگەی چیتر هاوکاری یەکیان نەکرد و من دوژمنێکی سەرسەخت و بێزار نەبو و روگرژ بوم. ئەوان پشتیان کردە من و رایان کرد، منیان بەشێرێك هاتەبەرچاو کەجل و بەرگی پاراستن و پارێزگاری کردنم لەبەردابێت. ئەو رۆژە هاوکاری تۆم کرد کەکەسە نزیکەکان تۆیان لەبیر کرد و خیانەتیان پێکردی و بێگانەکان رایان کرد و دور کەوتنەوە. پاداشتی من ئەوەبو لەناو ئێوەدا لەزەوی بدرێم و ریسوایی و گرفتاری ببێتە بەشم. چەندە مژدەت بەمندا کەدەمگەرێنیتەوە بەلاّم لەبەرابەر مژدەکانت چارەسەری هیچ رێویەکت نەکرد و لەمنت دور نەخستەوە. ئێستا کارم گەشتۆتە جێگەیەك کەهەندێ کات وشترە پیرەکان دەلەوەرێنم و هەندێ کات کەشوان مەڕەکان بۆ ئاودان دەبات، دەبمە هاورێی. دەڵێی من ئەو کەسە نەبوم کە بۆ شەڕ سوار سەمەندێك بوبێتم. ئەو کەسە نەبوم کەشەڕکەرە بوێرە بەئەزمونەکانم غەلتانی خوێن کردبێت. دەڵێی من ئەو کەسە

نەبوم بۆ بەرگری کردن لەنێوە ڕێگەم لەموغەیرە گرت و بەشمشێر هێرشم کردە سەر و ئەمە لەکاتێکدا بو ئەو پیاوە ترسەنۆکە پەستە لەبەرابەرم رایکرد و هاواری لێ بەرز بویەوە. ئەسپم بەدوای سوپاییەکاندا غاردا کەئاهەنگی سەرەوەی سەجاس و ئەبهەریان کردبو. (ئەبلام)م بەهێرشی خۆم دور نەخستەوە کە وەك پۆلێك لەمەلە ئاگرخۆرەکان ترسان و رەمیان کرد و من سەرکەوتو و نەزان بۆ دواوە گەڕامەوە بۆ گۆڕەپانی شەڕ. مەگەر لەناو سوارەکاندا نەبینرام کە لەقەزوێن و شەروین و کیدەر سەرقاڵی شەڕ بون. لەم رۆژگارە درێژە، باشیەکان پشتیان کردۆتە من و جوانی روخساری قێزەونی خۆی نیشانی منداوە. خەڵکانی من دور نەبن هەرچەند لەوان دلگرانم، هەرچەند لەناو ئەوان پێشیلێ کرام و تاوانێکی قورسم دا. ئەم جیهانە دوای ئەوان هیچ خۆشیەکی نیە کە من هەمیشە لەوان دورم و لەهەر لایەکەوە گەمارۆ دراوم.

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە عەبداللە کوڕی خەلیفە چی لەگەڵ عودەی کوڕی حاتەم کرد و لەشەڕی صەفین چی رویدا. لەبەر ئەمە بو کەلێرەدا ئاماژەمان پێنەدا.

عەبداللە کوڕی خەلیفە دوای مەرگی زیاد کوڕی ئوبیە لەجەبەلەین مرد.

دواتر کەریم کوڕی عەفیف کەلەهاوەڵانی حوجر کوڕی عودەی بو، هێنایانە لای زیاد. پرسی: ناوت چیە؟ وتی: کەریم کوڕی عەفیف. زیاد وتی: چەندە جوانە ناوی تۆ و ناوی باوکت و چەندە قێزەونە کرداری تۆ و بۆچونی تۆ. کەریم وتی: سوێند بەخوا زوە بەخێرایی لەبۆچونی من ئاگادار بویتەوە ( و لەبەر ئەمە بۆچونی من نازانیت.)

دەڵێت: زیاد کوڕی ئوبیە دوانزە کەس لەهاورێکانی حوجر کوڕی عودەی خستە زیندانەوە و دواتر سەرپەرەستی بازارەکانی لەو سەردەمەدا بانگ کرد کە ئەم کەسانە بون: عەمرۆ کوڕی حورەیس سەرپەرەستی بازاری خەڵکانی مەدینە، خالید کوڕی عوروفتە سەرپەرەستی بازاری تەمیم و هەمەدان، قەیس کوڕی وەلید سەرپەرەستی بازاری رەبیعە وکێندە و ئەبو موراد کوڕی موسا سەرپەرەستی بازاری مەزحەج و ئەسەد. ئەوان شایەتیان دا کەحوجر چەندین دەستەی لەدەوری خۆی کۆکرکدۆتەوە و بەئاشکرا جوێنی بەخەلیفە داوە و خەڵکی بۆ شەڕ دژی سەروەری باوەرداران هانداوە. گومانی کردوە کە ئەم کارە (فەمرانڕەوایی) تەنیا بۆ بنەماڵەی ئەبوتالب شیاوە.

لەشارەکاندا شۆڕشی دروست کردوە، کارگوزارانی سەروەری باوەڕدارانی دەرکردوە و پاکی و داوێن پاکیەکی بێ چەند و چونی بۆ ئەبو توراب جێگیر و سەقامگیر کردوە. بۆی پاڕاوەتەوە و سڵاوی بۆ ناردوە و بێزاری خۆی بەرامبەر بەدوژمنان و نەیارانی ئەو دەربڕیوە. ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەون، سەرکردەی هاورێکانی ئەون و باوەڕ و ئەندێشەی ئەو لەسەردا پەروەردە دەکەن. زیاد سەیری شایەتی شایەتەکانی کرد و وتی: حەز دەکەم لەم چوار کەسە زیاتر بن. خەڵکی کۆکردەوە تا لەزیانی حوجر کوڕی عودەی شایەتی بدەن. ئە م کەسانە شایەتیان دا: ئیسحاق کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیداللە، موسا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیداللە، مونزەر کوڕی زوبەیر، عومارە کوڕی عوقبە کوڕی ئەبی موعیت، عەمرۆ کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص و کەسانیتر. لەناو ناوی شایەتەکان شورەیح ەك حارس (دادیار) و شورەیح کوڕی هانی نوسی. شورەیح کوڕی هانی وتی: من شایەتیم نەدا و ئەوم سەرکۆنە کرد.

دواتر زیاد حوجر کوڕی عودەی و هاوەڵەکانی بەوایل کوڕی حوجری حەزرەمی و کەسیر کوڕی شەهاب سپارد و فەرمانی پێدان بیانبەن بۆ شام. شەوانە بەرێکەوتن. کاتێك گەیشتنە غەریین، شورەیح کوڕی هانی خۆی بەوان گەیاند و نامەیەکی بەوایل دا و وتی: ئەمە بگەیێنە بەسەروەری باوەڕداران. نامەکەی وەرگرت. بەرێکەوت تاگەیشتنە (مەرج عەزرا) لەنزیکی دیمەشق. ئەم کەسانە بون: حوجر کوڕی عودەی، ئەرقەم کوڕی عەبداللە کێندی، شەریك کوڕی شەدادی حەزرەمی، صەیفی کوڕی فەسیلی شەیبانی، قەبیصە کوڕی زوبەیعەی عەبسی، کەریم کوڕی عەفیفی خەسعەمی، عاصم کوڕی عەوف بەجلی، وەرقا کوڕی سومەی بەجلی، کودام کوڕی حەیانی عەنزی، عەبدولرەحمان کوڕی حسانی عەنزی، موحریز کوڕی شەهابی تەمیمی و عەبداللە کوڕی حەویەی سەعدی تەمیمی. دوانزە پیاو بون. زیاد دو پیاوی دیکەی لەگەڵ ئەوان رەوانە کرد. عوتبە کوڕی ئەخنەس لەسەد کوڕی بەکر و سەعد کوڕی نەمرانی هەمەدانی. ژمارەیان گەیشتە چواردە کەس.

معاویە کەسی بەدوای وایل کوڕی حوجر و کەسیر کوڕی شەهاب رەوانە کرد و ئەم دوانەی هێنایە لای خۆی و نامەکەی وەرگرت و خوێندیەوە. وایل نامەکەی هانی کوڕی شورەیحی پێدا کەبینی بەمشێوەی نوسیویەتی: ئاگاداریان کردومەتەوە کەزیاد ناوی

منی وەك شایەت نوسیوە. شایەتی من سەبارەت بەحوجر بەمشێوەیە: ئەو نوێژ دەخوێنێت، زەکات دەدات، بەردەوام حەج و عومرە بەجێ دێنێت، خەڵك بۆ چاکە فەرمان دەدات، لەخراپە دوریان دەخاتەوە، کوشتنی ناڕەوایە و تالآن کردنی سامانەکەی ناڕاست. ئەگەر دەخوازیت، بیکوژە و ئەگەر ناخوازیت ئازادی بکە. معاویە وتی: بەمشێوەیە ئەم پیاوە وەك ئێوە شایەتی دژی حوجر نادات. فەرمانیدا و ئەوانیان لەمەرج عوزرا خستە زیندانەوە. ئەو دو پیاوەی زیاد لەگەڵ حوجر و هاورێکانی رەوانەی کردبو، گەیشتن. کاتێك گەیشتن عامر کوڕی ئەسوەدی عجلی ڕۆشتە لای معاویە تا لەگەیشتنی ئەوان ئاگاداری بکاتەوە. حوجر کوڕی عودەی زنجیر لەدەست و پێ، هەستا و وتی: بەمعاویە بڵێ رژاندنی خوێنی ئێمە بۆ ئەو ناڕەوایە. ئاگاداری بکەرەوە کەئەمانیان پێداوین و لەگەڵ ئەو ئاشتیمان کردوە و ئەو لەگەڵ ئێمە پەیمانی ئاشتی بەستوە. ئێمە کەسمان لەموسوڵمانان نەکوشتوە تا کوشتنی ئێمە بۆ ئەو ڕەوا بێت. •

عامر ڕۆشتە لای معاویە و لەگەیشتنی ئەو دوپیاوە ئاگاداری کردەوە. یەزید کوڕی ئەسەدی بجلی هەستا و کوڕە مامەکانی عاصم کوڕی عەوف و وەرقا کوڕی سومەی لەو داوا کرد. لەبەرژەوەندی ئەم دوانە شایەتی نامەیەکی نوسیبو کەئەوانی بەبێگوناه لەقەڵەم دەدا و لەشایەتیە درۆیەی بۆ ئەوانیان هەڵبەستبو، بێزاری خۆی دەربڕی. معاویە هەردوکیانی ئازاد کرد. وایل کوڕی حوجر سەبارەت بەئەرقەم کوڕی عەبداللە ، ئەبوالاعوەری سولەمی سەبارەت بەعوتبە کوڕی ئەخنەس و حومرە کوڕی مالکی هەمەدانی سەبارەت بەسەعد کوڕی ئەمران نێوەنجیگەریان کرد کەمعاویە ئەوانی ئازاد کرد. مالك کوڕی هوبەیرەی سەکونی هەستا و وتی: کوڕە مامەکەی من حوجر کوڕی عودەی ببەخشە. معاویە پێی وت: ئەو سەرکردەی ئەم کەسانەیە و ئەگەر ئازادی بکەم، دەترسم خەڵکی شارەکەی خۆی دژی من هانبدات و دواتر ناچار ببم تۆ بۆ شەڕی ئەو لەعێراق رەوانە بکەم. وتی: ئەی معاویە: لەشەڕی سەفین شان بەشانی تۆ لەگەڵ کوڕی مامەکەت شەڕم کرد تا سەرکەوتیت و فەرمانڕەوایەتیت گرتەدەست و ترس و زیان لەتۆ دورکەوتەوە. ئێستا داوای بەخشینی کوڕە مامەکەم دەکەم بەڵام پێت نەبەخشیم. هەستا و ڕۆشت و خانەنشین بو.

معاویە هودبە کوڕی فەیازی قوزاعی و حوصەین کوڕی عەبدالله کەلابی و ئەبو شەریف بەدی بۆ لای حوجر و هاوڕێکانی ڕەوانە کرد تا ئەو کەسانەی فەرمانی کوشتنیان دەرکرابو، بکوژن. کاتێك خەسعەمی یەکێك لەوانی بەیەك چاو بینی، وتی: نیوەی ئێمە دەکوژێت و نیوەمان ئازاد دەکات. شەش کەسیان ئازاد کرد و هەشت کەسیان کوشت. پێش کوژران پێیان وتن: فەرمانمان پێدراو پێش کوشتنی ئێوە بێزاری دەربڕین لەعەلی و نفرین کردنی ئەوتان پێ پێشنیار بکەین کەئەگەر ئەو کارە بکەن ئازادتان دەکەین و ئەگەر خۆتان بەدور بگرن، دەتانکوژین. وتیان: ئەو کارە ناکەین. فەرمانیدا گۆڕەکانیان هەڵکەند و جل و بەرگی مردوانیان هێنا. حوجر و هاوڕێکانی سەراسەری شەو بەنوێژ و پاڕانەوە لەخوا سەرقاڵ بون. کاتێك بەیانی گەیشت، ئەوانیان بەرەو شوێنگەی کوشتن برد. حوجر کوڕی عودەی پێی وتن: ڕێگەم بدەن دەستنوێژ بگرم و نوێژ بخوێنم، چونکە هەرجار دەستنوێژم گرتوە، نوێژم خوێندوە. ڕێگەیان پێدا، نوێژی خوێند و گەڕایەوە و وتی: سوێند بەخوا هیچ کات نوێژێکی لەمە سوکتڕم نەخوێندبو. ئەگەر ترسی ئەوە نەدەبو کەگومانی ترسان لەمەرگم لێ بکەن، نوێژی زۆرم دەخوێند. دواتر وتی: ئەی خوایە، ئێمە لەدەرگایی تۆ گلەیی لەخەڵکەکەمان دەکەین چونکە خەڵ:انی کوفە بەزیانی ئێمە شایەتیان دا و خەڵکانی شام ئێمەیان کوشت. سوێند بەخوا، ئەگەر لێرەدا بمکوژن یەکەم سوارەی موسوڵمان دەبم کە لەماڵەکەی خۆیدا کوژراوە و یەکەم موسوڵمان دەبم کەسەگی ئەم دیارە بەدەوری مندا دەقروسکێنن. دواتر هودبە کوڕی فەیاز بەشمشێری دەرکێشراو بەرەو ڕوی ڕۆشت. حوجر لەرزی. پێیان وت: گومانت دەکرد لەمردن ناترسیت. بێزاری لەڕێبەرەکەت دەربڕە تا ڕزگارت بکەین. وتی: چۆن نەترسم و نەلەرزم کە گۆڕی هەڵکەنراو و جل و بەرگی مردو ئامادە کراو و شمشێرێکی دەرکێشراو دەبینم! سوێند بەخوا ئەگەر لەمەرگ دەترسم قسەیەکم نەهێناوەتە سەرزمان کەتوڕەیی خوای لێبکەوێتەوە. ئەویان کوشت و شەش کەسی دیکەیان لەگەڵ ئەودا کوشت.

عەبدولرەحمان کوڕی حەسانی عەنزی و کەریمی خەسعەمی وتیان: ئێمە بەرنە لای سەروەری باوەڕداران تا سەبارەت بەم پیاوە قسەیەکی هاوشێوەی خۆی بێنینە سەرزمان. داوای فەرمانیان لەمعاویە کرد و فەرمانی پێدان. کاتێك ڕۆشتنە لای،

خەسعەمی وتی: خوا خوا، ئەی معاویە! تۆ لەم دنیا تێپەڕە بەرەو دنیایی هەمیشەیی دەڕۆیت و ئەوسا لێت دەپرسن لەرشتنی خوێنی ئێمە چ مەبەستێك بو! پێی وت: سەبارەت بەعەلی چی دەڵێیت؟ وتی: ئەوەی تۆ دەیڵێیت. وتی: لەو دینەی عەلی بۆ خوا هەڵیبژاردبو، بێزاری دەکەیت؟ پیاو بێدەنگ بو. شیمر کوڕی عەبداللە لەبەنی قوحافە کوڕی خەسعەم هەستا لەمعاویە داوای لێخۆشبونی ئەوی کرد. معاویە ئەوی بەخشی لەسەر ئەو بنەمایی نەڕواتە کوفە. ئەو موسڵی هەڵبژارد بەڵام بەردەوام دەیوت: ئەگەر معاویە بمرێت، دەڕۆمە کوفە. یەك مانگ پێش مردنی معاویە مرد. دواتر بەعەبدولرەحمان کوڕی حەسانی وت: ئەی براکەم لەخەڵکی رەبیعە، سەبارەت بەعەلی چی دەڵێیت؟ وتی: مەپرسە چونکە بۆ تۆ باشترە. وتی: سوێند بەخوا دەپرسم. وتی: شایەتی دەدەم لەو کەسانە بو بەردەوام بیری خوای دەکردەوە، فەرمانی بەراستی و دروستی دەدا، دادپەروەری سەقامگیر دەکرد و لەخەڵکان خۆش دەبو. وتی: سەبارەت بەعوسمان چی دەڵێیت؟ وتی: یەکەم کەس بو دەرگاکانی ستەماکاری کردەوە و درگاکانی راستی و دروستی داخست. وتی: خۆتت کوشت! وتی: تۆم کوشت و بەداخەوە کە رەبیعە بونی نەماوە (تا لەبەرژەوەندی من نێوەنجیگەری بکات). معاویە ئەوی بۆ لای زیاد گەڕاندەوە و فەرمانی پێدا بەخراپترین شێوە بیکوژێت. زیاد ئەوی زیندە بەچاڵ کرد.

کوژراوەکان ئەم کەسانە بون: حوجر کوڕی عودەی، شەریك کوڕی شەدادی حەزرەمی، صەیفی کوڕی فەسیلی شەیبانی، قەبیصە کوڕی زوبەیعەی عەبسی، موحریز کوڕی شەهابی سەعدی تەمیم، کەدام کوڕی حەیانی عەنزی و عەبدولرەحمان کوڕی حسانی عەنزی کەزیاد زیندە بەچاڵی کرد. ئەم حەوت کەسە کوژران. نوێژیان لەسەر کردن و ئەوانیان بەخاك سپارد.

کاتێك هەواڵی کوژرانی حوجر و هاورێکانی بەحەسەنی بەسری گەیشت، وتی: نوێژیان لەسەر ئەوان خوێند و لەجل و بەرگی مەرگیان ئاڵاندن و بەخاکیان سپاردن و روی ئەوانیان کردە قیبلە؟ وتیان: بەڵێ. وتی: سوێند بەخوای کەعبە ئەوانیان بۆ حەج ناردوە.

بەڵام مالك کوڕی هوبەیرەی سەکونی، کاتێك معاویە بەنێوەنجیگەری ئەو سەبارەت

بەحوجر کوڕی عودەی رازی نەبو، خەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە لەگەڵ ئەوان بەرەو مەرج عوزرا بەرێکەوت تا حوجر و هاورێکانی رزگار بکات. بکوژەکانی حوجر و هاورێکانی ئەوانیان بینی و زانیان هاتون تا ئەوان رزگار بکەن. پێی وتن: چ هەواڵێکتان پێیە؟ وتیان: ئەم کەسانە لەباوەڕی خۆیان پەشیمان بونەوە و ئێمە دەڕۆین تا سەروەری باوەڕداران ئاگادار بکەینەوە. ئەو بێدەنگ بو و بەرەو مەرج عوزرا بەرێکەوت. یەکێك لەو کەسانەی لەوێ بو، ئەوی بینی و هەواڵی کوژرانی کەسەکانی پێدا. چەندین سواری بەدوای بکوژەکاندا رەوانە کرد بەڵام ئەوانیان نەدۆزیەوە. ڕۆشتنە لای معاویە و ئاگاداریان کردەوە. معاویە وتی: گەرمایەکە لەناخیدا دروست بوە و ئەگەری هەیە تا ئێستا سارد بوبێتەوە. کاتێك شەو داهات، معاویە سەد هەزار درەمی بۆ رەوانە کرد و پەیامیدا کە: ئەوەی رێگر بو لەوەی بەنێوەنجیگەری تۆ رازی نەبم، ترسی ئەوە بو کەئەم کەسانە دوبارە ئاگری شەڕ دژی ئێمە داگیرسێنن کە ئاژاوەیەکی گەورەتر لەکوژرانی حوجری بۆ موسوڵمانان بەدواوە بێت. ئەو درەمەکانی وەرگرت و دڵخۆش بو.

کاتێك هەواڵی گیرانی حوجر بەعایشە گەیشت، عەبدولرەحمان کوڕی حارسی بۆ لای معاویە رەوانە کرد تا سەبارەت بەو و هاورێکانی نێوەنجیگەری بکات. ئەو کاتێك گەیشت کەمعاویە ئەوانی کوشتبو. عەبدولرەحمان بەمعاویەی وت: خۆڕاگری ئەبوسوفیان بۆ نەماوە؟ معاویە وتی: لەبەر ئەوە خۆراگریم نەماوە چونکە کەسانی خۆراگری وەك تۆ پشتیان کردۆتە دەربارەکەی من و کوڕی سومەییە ئەم بارە قورسەی خستە سەرشانم و هەڵمگرت.

عایشە وتی: ئەگەر ترسی ئەوە نەبێت کەهەر شتێك کەدەمانەوێت بیگۆڕین، خراپتر دەبێت، کاری کوشتاری حوجر و هاورێکانیمان دەگۆڕی. سوێند بەخوا تا ئەو شوێنەی من دەیناسم، ئازادەیەکی موسوڵمان کە بەردەوام حەج و عەمرەی دەکرد.

حەسەنی بەسری وتی: معاویە چوار کاری کرد کەهەر کام بەتەنیایی دەتوانێت ژیانی کەسێك بەرەو لەناوچون ببات: گرتنەدەستی فەرمانڕەوایی بەزۆری شمشێر بێ راوێژ کردن لەگەڵ موسوڵمانان لەگەڵ ئەوەی لەنێوان کەسانی فروان لەبنەماڵە و هاورێیانی پێغەمبەر ماون وبۆ ئەم کارە شیاوترن، دانانی کوڕە شەرابخۆر و بادەخۆرەکەی

کەبەردەوام هەوریشم لەبەر دەکات و تەپڵ لێدەدات، پەیوەستی کردنی زیادی بێ باوك بەبنەماڵەی ئەبوسوفیان لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: منداڵ هی سەرجێگەیە و لەش فرۆش پێشکەشە بەبەرد، و کوشتنی حوجر و هاورێکانی. هاوار بۆ حوجر، سەد هاوار بۆ حوجر و هاورێکانی حوجر.

خەڵکان دەیانوت: یەکەم ریسوایی بۆ موسوڵمانان، مردنی حەسەن کوڕی عەلی بو، یەکیتر بانگەوازەکەی زیاد و لەوان خراپتر کوژرانی حوجر و هاورێکانی. هندی ئەنساری کچی زەید کە لەلایەنگرانی عەلی بو، لەپرسەی حوجردا ئەم شێعرەی هۆنیەوە:

| | |
|---|---|
| ترفع ایها القمر المنیر | تبصر هل تری حجرا یسیر |
| یسیر الی معاویة بن صخر | لیقتله کما زعم الامیر |
| تجبرت الجبابر بعد حجر | و طاب لها الخورنق و السدیر |
| و اصبحت البلاد له محولا | کان لم یحیها مزن مطیر |
| الا یا حجر، حجر بن عدي | تلقتك السلامة و السرور |
| اخاف علیك ما اردی عدیا | و شیخا فی دمشق له زئیر |
| فان تهلك فكل زعیم قوم | من الدنیا الی هلك یسیر |

یانی: هەرچەند دەتوانی بەرز ببەرەوە ئەی مانگی تابان، جوان بڕوانە ئایا حوجر دەبینی کە بەرەو دەشتی مەرگ دەڕوات. لەمعاویە کوڕی صەخر نزیك دەبێتەوە تا ئەو شوێنەی فەرمانڕەوا وتویەتی، خوێنی بڕێژنە سەر زەوی. یاخیان دوای حوجر ئارام و ئاسودە بون و کۆشکەکانی خەورنەق و سەدیر بوبەجێگەی حەوانەوەیان. شارەکان دوای ئەو وشك و بێ گیا بون وەك بڵێی هیچ هەورێکی بارانزا بەسەر سەریانەوە رێگەی نەبڕیوە. ئەی حوجر، حوجر کوڕی عودەی، تەندروستی و شادمانی هاورێت بن، بۆ تۆ لەوە دەترسم کەعودەی لەناو برد و پیرێك لەدیمەشق کەوەك شێر بەردەوام دەینەڕاند. ئەگەر تۆ لەناو بچێت زۆر جێگەی سەرسوڕمان نیە چونکە هەمو سەرکردەکانی خەڵك لەم جیهانە رێگەی لەناوچون دەگرنەبەر.

سەبارەت بەکوژرانی حوجر ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە. یەکیان ئەمەیەکە: لەرۆژێکی هەینی زیاد کوڕی ئوبیە وتارێکی خوێندەوە و وتارەکەی درێژ کرد و

نوێژەکەی پشت گوێ خست. حوجر کوڕی عودەی پێی وت: بۆ نوێژ هەستن! ئەو درێژەی بەوتارەکەی خۆیدا. حوجر کوڕی عودەی پێی وت: بۆ نوێژ هەستن! دوبارە ئەو درێژەی بەوتارەکەی خۆیدا. دواتر حوجر ترسا نوێژەکەیان بفەوتێت، دەستی خۆی لە مشتێك لمدا و بۆ نوێژ راوەستا و خەڵکیش هەستانە سەرپێ. کاتێك زیاد ئەمەی بینی، هاتە خوار و لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند. ئەو نامەی بۆ معاویە نوسی و چەندین تۆمەتی بۆ حوجر هەڵبەست. معاویە بۆی نوسی تا بەتوندی بەئاسنەوە بیبەستێتەوە و رەوانەی لای ئەوی بکات. کاتێك ویستی بیگرێت، خەڵکەکەی هەستان تا پارێزگاری لێ بکەن. حوجر وتی: نا، گوێرایەڵین و فەرمان دەبەین. بەتوندی بەئاسنەوە بەستیانەوە و بۆ لای معاویەیان نارد. کاتێك ڕۆشتە لای وتی: سلاو لەتۆ ئەی سەروەری باوەڕداران. معاویە وتی: ئایا من سەروەری باوەڕدارانم؟ سوێند بەخوا نەدەتبەخشم نە بەداوای لێبوردنی تۆ رازی دەبم. بیبەنەدەر و بیکوژن. حوجر بەو کەسانەی ئەویان گرتبو، وتی: رێگەم بدەن با دو رکعەت نوێژ بخوێنم. وتیان: بیخوێنە. ئەو دو رکعەتەکەی بەخێرایی خوێند و دواتر وتی: ئەگەر ترسی ئەوەم نەدەبو کە گومانێکی تر لەمن بکەن، نوێژەکەم درێژ دەکردەوە. بەخەڵکەکەی وت: ئاسن لەمن مەکەنەوە و خوێنەکەم مەشۆن چونکە بەیانی معاویە دەبینم و رێگەی لێ دەگرم. کوشتیان. عایشە چاوی بەمعاویە کەوت و پێی وت: خۆارگریت چی لێهات کەحوجرت کوشت؟ معاویە وتی: فرمزانێك لای من نەبو. ئیبن سیرین دەڵێت: بەنێمەیان وتوە کاتێك مەرگی معاویە گەیشت، بەردەوام هاواری دەکرد و دەیوت: چەند رۆژێکی درێژم لەتاو تۆ هەیە ئەی حوجر.

## دانانی رەبیع کوڕی زیاد لەخوراسان

لەم ساڵەدا زیاد، رەبیع کوڕی زیادی حارسی وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد. حەکەم کوڕی عەمرۆ غەففاری لەکاتی مردنی خۆی ئەنس کوڕی ئەبی ئەناسی دانابو. زیاد ئەوی لەسەر کار لابرد و خولەید کوڕی عەبداللەی حە نەفی هێنایە سەرکار و دواتر ئەویشی لەسەر کار لابرد و رەبیع کوڕی زیادی لەجێگەکەی دانا. ئەمە لەسەرەتای ساڵی ٦٧١/٥١ زایینی بو. هاورێ لەگەڵ ئەو پەنجا هەزار کەسی لەخەڵکانی کوفە و بەسرە رەوانە کرد، لەناو ئەوان: بورەیدە کوڕی حوصەیب و ئەبو بەرزە کە هەردوك پێغەمبەریان بینبو. ئەوان لەخوراسان مانەوە. کاتێك گەیشتنە ئەوێ، بۆ شەڕی بەلخ ڕۆشتەدەر و بەئاشتی دەستی بەسەرداگرت. بەوتەی هەندێ کەس، دوای ئاشتی ئەحنەف کوڕی قەیس لەگەڵ خەڵکەکەی، درگاکانی ئەم شارەیان داخستبو. کوێستانیان بەزۆر گرت و لەو ناوچەیە تورکەکانیان کوشتار کرد. لەناو ئەوان نەیزەك ئەرخان مایەوە کە قوتەیبە کوڕی موسلیم لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی خۆی کوشتی.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: جەریر کوڕی عەبداللە بەجلی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٦٧٤/٥٤ زایینی مرد و لەساڵی مردنی پێغەمبەر باوەڕی هێنا، سەعید کوڕی زەید کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٨١/٦٢ زایینی یل ٦٧٨/٥٨ زایینی مرد و لەمەدینە بەخاك سپێردرا و یەکێك بو لەو دەکەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدرابو، ئەبوبەکرە نوفەیع کوڕی حارس کە چاوی بەپێغەمبەر کەوتبو و لەدایکەوە برای زیاد کوڕی ئوبیە بو. مەیمونە کچی حارس هاوسەری پێغەمبەر لەشوێنێك بەناوی سەریف کەپێغەمبەر یەکەم شەوی هاوسەرگیری خۆی لەگەڵ ئەودا لەوێ بەسەر برد و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٨٢/٦٣ یا ٦٦/ ٦٨٥ زایینی مرد.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. کارگوزارانی معاویە ئەو کەسانە بون کەپێشتر ئاماژەمان پێدان.

## ڕوداوەکانی ساڵی پەنجاو و دوی کۆچی( ٦٧٢ زایینی )

لەم ساڵەدا سوفیان کوڕی عەوف ئەسەدی بۆ شەڕی ڕۆمەکان ڕۆشتەدەر و زستانی لەوێ بەسەر برد و بەوتەی هەندێ کەس لەوێ مرد. ئەو عەبداللە کوڕی مەسعەدی فەزاری کردە جێگری خۆی. دەستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی لەسەرزەمینی ڕۆم مرد، بوسر کوڕی ئەبی ئەرتا بو کەسوفیان کوڕی عەوف هاوڕێیەتی دەکرد. لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدالله سەقەفی شەڕی هاوینەی دەست پێکرد.

## بزوتنەوەی زیاد کوڕی خێراشی عیجلی

لەم ساڵەدا زیاد کوڕی خێراشی عەجلی هاورێ لەگەڵ سێسەد سوار شۆڕشی دەست پێکرد و ڕۆشتە سەرزەمینی مەسکەن لەپانتاییەکانی سواد. زیاد دەستەیەکی بۆ روبەروبونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد کەفەرماندەکەیان صەعد کوڕی حوزەیفە یاکەسێکیتر بو. ئەوانیان کوشتار کرد و دواتر بەرەو ماە بەرێکەوتن.

## بزوتنەوەی مەعازی تایی

هەروەها لەم ساڵەدا پیاوێك لەتەی بە ناوی مەعاز لەبەرابەر زیاد شۆڕشی کرد و لەگەڵ سی پیاوی شەڕکەر ڕۆشتە روباری عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم. زیاد دەستەیەکی بۆ روبەروبونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد و ئەوانیان کوشتار کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئاڵای کردەوە و داوای ئەمانی کرد. ئەوان بەهاورێیانی روباری عەبدولرەحمان ناو دەبەن.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عاص حەجی کرد و کارگوزران هەمان کارگوزارانی ساڵەکانی پێش بون کە ئاماژەمان پێدان.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: عیمران کوڕی حوصیەنی خوزاعی لەبەسرە، ئەبو ئەیوبی ئەنساری کەناوەکەی خالید کوڕی زەیدە و لەبەیعەتی عەقەبە و شەڕی بەدر بەشداری کردبو و پێشتر وترا کە لەساڵی ٤٩/ ٦٦٩ زایینی لەکۆستانتین نۆپێل کوژرا، و کەعب کوڕی عوجرە لەحەفتا و پێنج ساڵیدا.

## ڕوداوەکانی ساڵی پە نجا و سێیەمی کۆچی( ٦٧٣ زایینی )

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی دایکی حەکەمی سەقەفی لەسەرزەمینی ڕۆم شەڕی کرد و زستانی لەوێ بەسەر برد.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕودس( دورگەیەك لەدەریا) دەستی بەسەردا گیرا. ئەم دورگە بەدەستی جونادە کوڕی ئەبی ئومەییەی ئەزدی دەستی بەسەرداگیرا و موسوڵمانان تیای دابەزین بەڵام لەڕۆمیەکان دەترسان. موسوڵمانان بوێرترین شەڕکەران لەگەڵ ڕۆمیەکان بون چونکە بەردەوام ڕێگەی دەریایان لێدەگرتن و دەستیان بەسەر کەشتیەکاندا دەگرت و معاویە بەردەوام بەخششی بۆ ڕەوانە دەکردن. دوژمن لەوان دەترسا، کاتێك معاویە مرد، کوڕەکەی یەزید ئەوانی گەڕاندەوە.

دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٠/ ٦٨٠ زایینی دەستی بەسەرداگیرا.

## مردنی زیاد

لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەمەزان/ سێپتامبەری ٦٧٣ زایینی زیاد کوڕی ئوبیە لەکوفە مرد.

هۆکاری مردنەکەی ئەوە بو کەنامەی بۆ معاویە نوسی: من عێراقم بەدەستی چەپم سەقامگیر کرد و دەستی ڕاستم بێ کار ماوەتەوە، دەستی ڕاستم لەحیجاز بکەرەوە. معاویە ئەو فەرمانەی بۆ نوسی. ئەم هەواڵە بەخەڵکی حیجاز گەیشت. دەستەیەك لەوان ڕۆشتنە لای عەبداللە  کوڕی عومەر کوڕی خەتاب و ئاگاداریان کردەوە. وتی: لەخوا بپاڕێنەوە. دواتر ڕویکردە قیبلە و لەخوا پاڕایەوە و خەڵك هاورێ لەگەڵ ئەو لەخوا پاڕانەوە. یەکێك لەدۆعاکانیان ئەمە بو: ئەی خوایە، زیانی زیاد لەئێمە دوربخەرەوە. ئەوەندە نەخایاند بڕینێکی قێزەون لەپەنجەی دەستی ڕاستی دەرکەوت و لەئازارەکەی گیانیدا. کاتێك مەرگی نزیك بویەوە، شورەیح دادیاری کوفەی بانگ کرد و پێی وت: ئەوەی دەیبینی، ڕویداوە، فەرمانیان پێداوم بیبڕمەوە. بۆچونی ڕاست بەمن بڵێ. شورەیح پێی وت: ترسی ئەوەم هەیە کۆتایی ژیانی تۆ گەیشتبێت و ئەوسا بەشێوەی دەست بڕوا بڕۆیتە دیداری خواوەند کە لەترسی دیداری ئەو دەستیان بڕیبێتیتەوە. یا ژیانت درێژە بکێشێت و پەنجە بڕاو بمێنیتەوە و مناڵەکانت لەبەر ئەمە سەرکۆنە بکەن (کە عەرەبەکان ئەم کارە دەکەن). زیاد وتی: من لەگەڵ ئەم

برینە لەیەك جێگادا نامێنەوە. شورەیح لای ئەو ڕۆشتەدەر و خەڵك پرسیاریان لێکرد وئەوانی ئاگادار کردەوە. ئەویان سەرکۆنە کرد و وتیان: بۆ ڕێگەت نەدا دەستی ببڕنەوە؟ شورەیح وتی: ڕاوێژکار ئەمینە.

زیاد بڕیاریدا پەنجەی خۆی ببڕێتەوە. کاتێك سەیری ئاگر و ئاسنی سورەوبوی کرد، ترسا و ئەو کارەی پشت گوێ خست. کاتێك مەرگی گەیشت، کوڕەکەی پێی وت: بۆ تۆ شەست پارچەم ئامادە کردوە، کامیان بکەمە کفنی تۆ؟ وتی: کوڕەکەم، شتێك لەباوکت نزیك بۆتەوە کەلەم جلانەی بەری باشترە، بەم زوانە جلەکانی لێ دەرفێنن. ئەو مرد و لەسویە (شوێنێك لەنزیك کوفە) بەخاکیان سپارد.

کاتێك هەواڵی مەرگی بەعەبدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت، وتی: هیچ ·کات دیار نەبیت زادەی سومەییە! نە شتێك بۆ ئەو دنیا ڕەوانە کرد نە لەم دنیا هیچت لێ مایەوە.

لەدایك بونی ئەو لەساڵی یەکەمی کۆچی/ ٦٢٢ زایینی بو. مسکینی دارمی لەپرسەی ئەودا وتی:

| | |
|---|---|
| رایت زیادة الاسلام ولت | جهارا حین ودعنا زیاد |

یانی: ئەو کاتەی زیاد ماڵئاوایی لێکردین، بەئاشکرا بینیم فراوان بونی ئیسلام ڕوی لەکەمی کرد.

فەرزدق لەوەڵامی ئەو ئەم قەسیدەی هۆنیەوە. تا زیاد زیندو بەخراپە باسی نەکرد. چەند دێرێکی بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| امسکین ابکی الله عینیك انما | جری فی ضلال دمعها فتحدرا |
| بکیت امرا من اهل میسان کافرا | ککسرا علی عدانه او کقیصرا |
| اقول له لما اتانی نعیه | به لابظبی بالصریمة اعفرا |

یانی: ئەی سواڵکەری بەدبەخت (ئەی مسکێن) خوا چاوەکانت پڕ گریان بێڵێتەوە کە بەگومڕایی فرمێسکی وەڕاند و کەوتە خوار. بۆ پیاوێکی ناباوەڕ لەپیاوانی میسان گریایت، هاوشێوەی خوسرەو لەرۆژگاری خۆیدا یا سزار لەسەرزەمینە خوێنبارەکەی. کاتێك هەواڵی مردنەکەی بەمن گەیشت، پێم وت: بەمەرگی ئەو چاوم ڕون بێتەوە نەك ڕاوی ئاسکێکی سوررەنگ لەزیخەلان.

زیاد پیاوێکی سورکەلە بو کەچاوی راستی کەمێك خوار بو. ریشی سپی و نوك تیژ. کراسێکی لەبەردابو و هەندێ کات پینەی دەکرد.

## مردنی رەبیع کوڕی زیاد

لەم ساڵەدا رەبیع کوڕی زیادی حارسی کارگوزاری خوراسان لەلایەن زیادەوە، کۆچی دوایی کرد.

هۆکاری مردنەکەی ئەوە بو کەلەکوژرانی حوجر کوڕی عودەی تورە بو تا ئەو جێگەی کەوتی: دوای ئەو عەرەبەکان بەردەوام بەنەشکەنجە دەکوژرێن. ئەگەر لەکاتی کوژرانی ئەو رەمیان دەکرد، ئەشکەنجە کوژ نەدەکران. بەلاَم حەوانەوە و ریسوا بون. دوای ئەم وتارە حەفتەیەك چاوەروانی کرد، دواتر رۆژی هەینی هاتەدەر و وتی: ئەی خەلَکینە، من لە م ژیانە بێزار بوم، ئێستا لەخوا دەپارێمەوە و ئێوەیش دۆعام بۆ بکەن. دوای نوێژ، دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: ئەی خوایە، ئەگەر لای تۆ چاکەی بۆ من تیایە، هەرچی زوتر من بۆ لای خۆت ببەرەوە. خەلَك وتیان: دۆعاکەی گیرا بێت! دواتر رۆشتەدەر. هێشتا لەبەر چاو ون نەببو کەکەوتە سەر زەوی. خەلَك هەلَیان گرت و بردیانەوە بۆ مال. کوڕەکەی عەبدالله کوڕی رەبیعیان وەك جێگری ئەو دەست نیشان کرد و رەبیع لەهەمان رۆژدا مرد. کوڕەکەی دوای دو مانگ مرد و پێش مردن، خولەید کوڕی یەربوعی حەنەفی لەجێگەی خۆی دانا و زیاد فەرمانڕەوایەتیەکەی پشت راست کردەوە. کاتێك زیاد مرد، فەرمانداری بەسرە سەمورە کوڕی جوندەب بو و لەکوفە عەبدالله کوڕی خالید کوڕی ئەسید فەرمانڕەوایەتی دەکرد. سەمورەیان بۆ هەژدە یا شەش مانگ لەپێگەکەیدا هێشتەوە و دواتر معاویە ئەوی لەسەر کار لابرد. سەمورە وتی: نفرینی خوات لێ بێت معاویە! سوێند بەخوا ئەگەر هاوشێوەی ئەو فەرمانبرداری خوام دەکرد، هیچ کات ئەشکەنجەی نەدەکردم. رۆژێك پیاوێك رۆشتە لای سەمورە و زەکانی سامانەکەی خۆیدا و رۆشتە مزگەوت و نوێژی خوێند. سەمورە فەرمانی کوشتنی دەرکرد و ئەویان کوشت. ئەبوبەکری لای ئەو تێپەڕی و وتی: رزگارە ئەو کەسەی خۆی پاك و خاوێن رابگرێت. دواتر ناوی خوا بێنێتە سەرزمان و نوێژ بخوێنێت (اعلا/٨٧/١٤—١٥) دەلَێت: سەمورە نەمرد تا ئەو کاتەی سەرمایەکی

کوشەندە دایگرت و بەناشیرینترین شێوە گیانیدا چونکە دەردی زۆر چێشت و بەردەوام دەیقروسکاند.

بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عاص، فەرمانداری مەدینە، لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید فەرمانداری کوفە، فەرمانداری بەسرە سەمورە کوڕی جەندەب و خوراسان لەژێر دەستی خولەید کوڕی یەربوعی حەنەفیدا بو.

## درێژەی روداوەکان

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: عەبدلرەحمان کوڕی ئەبی بەکری صدیق، لەکاتی خەو لەرێگەی مەککە، دەستەیەك دەڵێن: دواى ئەوە مرد، فیروزی دەیلەمی کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو و معاویە ئەوی کردبوە فەرمانداری صەنعا ، عەمرۆ کوڕی حەزمی ئەنساری، فوزالە کوڕی عوبەیدەی ئەنساری لەدیمەشق کەدادیاری ئەم شارەی لەلایەن معاویەوە پێ سپێردرابو و دەستەیەك دەڵێن: لەکۆتاییەکانی رۆژگاری معاویە مرد و هەندێکیتر ئاماژە بەگێرانەوەی دیکە دەدەن. ئەو لەشەڕی ئۆحۆد و دواى ئەوە هاوشانی پێغەمبەر بو.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و چوارەمی کۆچی( ٦٧٤ زایینی )

## شەڕ لەگەڵ ڕۆمیەکان و گرتنی دورگەی ئارواد

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مالك زستانی لەسەرزەمینی ڕۆم بەسەر برد. شەڕی هاوینە بەسەرکردایەتی مەعن کوڕی یەزیدی سولەمی دەستی پێکرد.
هەروەها لەم ساڵەدا موسوڵمانان بەفەرماندەیی جونادە کوڕی ئەبی ئومەییە، دەستیان گرت بەسەر دورگەی ئارواد لەنزیك کۆنستانتین نۆپێل و حەوت ساڵ لەوێ مانەوە. موجاهید کوڕی جوبەیر لەگەڵ ئەواندا بو. کاتێك معاویە مرد و کوڕەکەی هاتە سەر کار، فەرمانی گەڕانەوەی ئەوانی دەرکرد و ئەوان گەڕانەوە.

## لەسەرکار لابردنی سەعید کوڕی عاص لەمەدینە

دانانی مەروان کوڕی حەکەم
لەم ساڵەدا معاویە سەعید کوڕی عاسی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و مەروان کوڕی حەکەمی لەجێگەکەی ئەو دانا.
هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کەمعاویە بۆ سەعید کوڕی عاس نامەی نوسی و فەرمانی پێدا ماڵی مەروان وێران بکات و هەمو سامانەکەی زەوت بکات تا تایبەتی بکات بەخۆی، هەروەها فەدەکیشی لێ وەربگرێت. معاویە فەدەکی پێ بەخشیبو. سەعید لای معاویە نێوەنجیگەری کرد تا ئەم کارە نەکات. معاویە جارێکیتر نامەی بۆ نوسی و فەرمانەکەی دوبارە کردەوە. سەعید نەیکرد و هەر دو نامەکەی لای خۆی هێشتەوە. معاویە ئەوی لەسەر کار لابرد و مەروانی لەجێگەکەی ئەو دانا و فەرمانی پێدا هەمو دەست بەسەر هەمو سامانەکەی سەعید کوڕی عاسدا بگرێت و ماڵەکەی وێران بکات. مەروان کرێکارەکانی هەڵگرت و بەرەو ماڵی سەعید بەڕێکەوت تا وێرانی بکات. سەعید پێی وت: ماڵەکەم وێران دەکەیت؟ وتی: بەڵێ، سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم کە ئەگەر فەرمانی بەتۆ دەدا ماڵەکەی منت وێران دەکرد. سەعید وتی: نەمدەکرد. مەروان وتی: سوێند بەخوا دەتکرد. سەعید کۆیلەکەی خۆی بانگ کرد و

وتی: نامەکانی معاویەم بۆ بێنە. کۆیلە هەر دو نامەکەی هێنا. کاتێك مەروان نامەکانی بینی، وتی: فەرمانی بەتۆدا و نەتکرد و منت ئاگادار نەکردەوە! سەعید وتی: نەمدەویست بەم کارە لای تۆ شانازی بەخۆمەوە بکەم. معاویە دەیەوێت من و تۆ دژی یەك هانبدات. مەروان وتی: سوێند بەخوا تۆ لەمن باشتریت. گەڕایەوە و ماڵەکەی سەعیدی وێران نەکرد. سەعید نامەی بۆ معاویە نوسی: سەیرە لەسەروەری باوەڕداران کە لەناو ئێمەی خزمدا ئەم کارە دەکات! ئەو لەناو ئێمە تۆوی دوبەرەکی دەچێنێت. سەروەری باوەڕداران بەسەبر و خۆراگری خۆی کە لەنێوان دو کاری قێزەون، هەردوکیان بەخراپ دەزانێت و بەخششی فراوان دەکات، دەیەوێت پەیوەندی ئێمە لەگەڵ یەك بپچڕێنێت و کینە لەناوماندا هەڵگیرسێنێت تا منداڵەکان وەك میرات لەباوکانیان بۆیان بمێنێتەوە. ئەگەر منالی یەك باوك نەدەبوین، خوای ئێمەی بۆ هاوکاری کردنی سەروەری باوەڕداران، هەمان جێگری ستەم لێکراوی بەستەم کوژراو، هاودەست نەدەکرد و قسەکانمان یەك نەدەبو، شیاوە بۆ سەروەری باوەڕداران پارێزگاری لەم دەسکەوتانە بکات.

معاویە نامەی بۆ سەعید نوسی و داوای لێبوردنی لێکرد و بێ ئاگایی و بێزاری خۆی لەو کارە نیشاندا و مژدەی پێدا بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە. سەعید ڕۆشتە لای معاویە و معاویە سەبارەت بەمەروان پرسیاری لێکرد و سەعید وەسفی کرد. معاویە پرسی: چ شتێك دور خستە نێوان ئێوە؟ وتی: بۆ گەورەیی خۆی لەمن ترسا و بۆ گەورەیی خۆم لێی ترسام. وتی: ئەو لای تۆ چی هەیە؟ وتی: چ لەشوێنێك بێت چ نەبێت، شادمانی دەکەم.

## دانانی عوبەیدالله کوڕی زیاد لەخوراسان

لەم ساڵەدا معاویە سەمورە کوڕی جوندەبی لەبەسرە لابرد و عەبدالله کوڕی عەمرۆ کوڕی غیلانی بۆ ماوەی شەش مانگ لەجێگەکەی ئەو دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە عوبەیدالله کوڕی زیادی وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە عوبەیدالله دوای مەرگی باوکی ڕۆشتە لای معاویە. لێی پرسی: باوکت کێی لەکوفە و بەسرە دانا. عوبەیدالله ئاگاداری کردەوە. معاویە وتی: ئەگەر باوکت تۆی دەستنیشان دەکرد، فەرمانداری تۆم بەهێز دەکرد. عوبەیدالله وتی: سوێندت دەدەم بەخوا با لەدوای تۆ کەس ئەم قسەیە بە من نەڵێت: ئەگەر باوکت و مامت تۆیان وەك فەرماندار دەست نیشان دەکرد، فەرمانداری تۆمان بەهێز دەکرد. معاویە ئەوی کردە فەرمانداری خوراسان و بەم شێوەیە ئامۆژگاری کرد: لەخوا بترسە و هیچ خواستێك مەخەرە پێش خۆپارێزی خۆت چونکە خۆپارێزی تاوان بەخشی هەمو شتێکە. ئاگاداربە ئابرووی خۆت بەکارە فێزەونەکان نەرازێنیتەوە و هەر کات پەیمان و بەڵێنێکت دا، ڕێزی لێبگرە. زۆر بەکەم مەفرۆشە. هیچ فەرمانێك مەدە مەگەر ئەوەی بەجوانی هەڵیسەنگێنیت و کاتێك فەرمانت دەرکرد بەهیچ شێوەیەك پەشیمان مەبەرەوە. هەر کات ڕوبەڕوی دوژمنێك بویتەوە و سوپاکەی لەدەرەوەی زەوی بەسەر تۆدا زاڵ بون ڕێگە مەدە لەناوەوە بەسەر تۆدا زاڵ بن. کەس تەماحکار مەکە تا زیاتر لەمافی خۆی داوا بکات و هیچ کەس لەمافی خۆی بێ بەش مەکە. دواتر ماڵئاوایی لێکرد. لەم کاتەدا عوبەیدالله بیست و پێنج ساڵ تەمەنی بو. ئەو ڕۆشتە خوراسان و روباری بڕی و گەیشتە کوێستانەکانی بوخارا. ئەم ڕێگەی بەسواری وشتر بڕی. یەکەم کەس بو بەسوپاوە لەکوێستانەکانی بوخارا تێپەڕی. رامنی و نسف و بیکەندی گرت کەلەشارەکانی بوخارا بون. لێرە بەسەر خەڵکانی بوخارا زاڵ بو و تاڵانی زۆر و گرانی لەوان بەدەست هێنا. کاتێك روبەروی تورکان بویەوە و ئەوانی تێکشکاند، هاوسەری پاشاکەیان لەگەڵیاندا بو. کاتێك شاژن ویستی خۆی رزگار بکات، سوپاییەکان خێراییان لەخۆیان نیشاندا و ئەو نەیتوانی پێڵاوەکانی لەپێ بکات.

یەکیانی لەپێ کرد و ئەویتریان بەجێهێشت. موسوڵمانان هەڵیانگرت و بەدوسەد هەزار درەم خەملاندیان. شەڕی ئەو لەگەڵ تورەکان لەشەڕە ناودارەکانی سەرزەمینی خوراسان بو. ئەو ئازایەتی و بوێری زۆری لەخۆی نیشاندا و دو ساڵ لەخوراسان مایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێ

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم فەرمانداری مەدینە لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.
فەرمانداری کوفە عەبدالله کوڕی خالد یا زوحاك کوڕی قەیس و فەرمانداری بەسرە عەبدالله کوڕی عەمرۆ کوڕی غیلان بو.
لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: ئەبو ئەیوبی ئەنساری لەحەفتا ساڵیدا کە دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٤٠/٦٦٠ زایینی کۆچی دوایی کرد و عەلی نوێژی لەسەر خوێند. ئەو لەهەمو شەڕەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالب بەشداری کرد و لەشەڕکەرە دیارەکانی شەڕی بەدر بو. حومەیتب کوڕی عەبدولعوزەی لەتەمەنی سەد و بیست ساڵیدا، سەوبان کۆیلەی پێغەمبەر، ئوسامە کوڕی زەید کە دەستەیەك دەڵێن لەساڵی ٥٨/٦٧٨ زایینی یا لەساڵی ٥٩/٦٧٩ زایینی مرد. سەعید کوڕی یەربوع کوڕی عەنکەسە لەتەمەنی سەد و بیست و چوار ساڵی کە چاوی بەپێغەمبەر کەوتبو. مەخرەمە کوڕی نەوفل لەو کەسانەی کە لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنا و لەتەمەنی سەد و پانزە ساڵیدا مرد. عەبدالله کوڕی ئونەیسی جوهەنی، زەید کوڕی شەجەرەی رەهاوی کە لەم ساڵەدا یا لەساڵی ٥٨/ ٦٧٨ زایینی لەشەڕێکدا کوژرا.

## ڕوداوەکانی ساڵی پەنجا و پێنجی کۆچی (٦٧٥ زایینی)

بەوتەی هەندێ کەس، لەزستانی ئەم ساڵەدا، سوفیان کوڕی عەوق ئەزدی و بە وتەی هەندێ کەس، عەمرۆ کوڕی موحریز و بەوتەی هەندێ کەس، عەبدالله کوڕی قەیسی فەزاری و بەوتەی دەستەیەکیتر عەبدالله کوڕی مالك فەرمانڕەوا بو.

## فەرمانڕەوایی کوڕی زیاد لەبەسرە

لەم ساڵەدا معاویە عەبدالله کوڕی عەمرۆ کوڕی غەیلانی لەفەرمانداری بەسرە لابرد و عوبەیدالله کوڕی زیادی لەجێگەکەی ئەو دانیشاند.
هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو عەبدالله کوڕی عەمرۆ لەسەر تەختی وتاردانی بەسرە وتارێکی خوێندەوە و پیاوێك لەبەنی زەببە وردە بەردی تێگرت و عەبدالله دەستی بڕی. بەنی زەببە ڕۆشتنە لای و وتیان: ئەم هاوڕێی ئێمە ئەو گوناحەی کرد کە لای کەس داپۆشراو نیە و تۆیش سزات دا. ما ئێمە دڵنیا نین لەوەی هەواڵی ئەم کارە بەگوێی سەروەری باوەڕدارن نەگات و ئەو فەرمانی سزای کشتی دەربکات. بۆ ئێمە نامەیەك بۆ سەروەری باوەڕداران بنوسە تا یەکێك لەخۆمان بۆ بەرێت و لەنامەکەدا بەمشێوە بنوسە کە لەبەر تێکەڵاو بون لەگەڵ یەکێکیتر یا لەبەر کارێکی نادیار دەستیت بڕیوە. نامەکەی بۆ نوسین. کاتێك سەری ساڵ هات، عەبدالله ڕۆشتە لای معاویە و خەڵکانی زەببە بەنامەکەوە گەیشتن و ئەم داواکاریەیان بۆ دەرگای معاویە بەرز کردەوە کە فەرماندار دەستی هاوڕێکەیانی بێ گوناح بڕیوە و دەبێت دەستی ببڕدرێتەوە. معاویە وتی: سزادانی جەستەی یەکێك لەکارگوزارەکانم، نەگەری نیە و بەڵام تاوانەکەی لەگەنجینە دەدەم. ئەو عەبداللەی لەبەسرە لابرد و عوبەیدالله کوڕی زیادی لەجێگەکەی دانا. کوڕی زیاد ئەسلەم کوڕی زورعەی کلابی وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد. ئەو نە شەڕی کرد و نە دەستی بەسەر هیچ ناوچەیەکدا گرت.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا معاویە عەبداللە کوڕی خالیدی لەفەرمانداری کوفە لابرد و شوێنەکەی دا بەزوحاك کوڕی قەیس. هەندێك ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەداوە کەپێشتر ئاماژەمان پێدان.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەرقەم کوڕی ئەبی ئەرقەمی مەخزومی کەپێغەمبەر لەماڵەکەی ئەو لەمەککە خۆی شاردەوە. تەمەنی هەشتا ساڵی خایاند و دەستەیەك دەڵێن: رۆژی مردنی ئەبوبەکر مرد، ئەبو یەسر کەعب کوڕی عەمرۆ ئەنساری لەبەدریەکان کە لەصەفین شان بەشانی عەلی شەڕی کرد و دەستەیەك دەڵێن پێش ئەم مێژوە مرد.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم حەجی لەگەڵ خەڵك کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و شەشی کۆچی( ٦٧٦ زایینی )

لەم ساڵەدا جونادە کوڕی ئەبی جونادە کوڕی ئومەییە زستانی لەسەرزەمینی ڕۆم بەسەر برد. دەستەیەك دەڵێن: عەبدولرەحمان کوڕی مەسعود زستانی لەسەرزەمینی ڕۆم بەسەر برد. دەستەیەك دەڵێن: یەزید کوڕی شەجەرە لەدەریا شەڕی کرد و عەیاز کوڕی حارس لەوشکانی. معاویە لەمانگی ڕەجەب/ مەی ٦٧٦ حەجی عەمرەی کرد. ئایین حەج لەلایەن وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی سوفیان ئەنجام درا.

## بەیعەت بۆ یەزید وەك جێگری باوك

لەم ساڵەدا خەڵك لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەتیان کرد کەوەك جێگری باوکی دەستنیشانی بکەن.
سەرەتای ئەم کارە و یەکەم هەنگاو لەلایەن موغەیرە کوڕی شەعبەوە بو چونکە معاویە دەیوست ئەو لەفەرمانداری کوفە لابەرێت و سەعید کوڕی عاس لەجێگەکەی دابنێت. هەواڵی ئەم کارەی پێگەیشت. بەخۆی وت: باشترە خۆم بڕۆمە لای معاویە و داوای دەست لەکار کێشانەوە بکەم تا خەڵك گومان بکەن لەفەرمانداری بێزارم. ڕۆشتە لای معاویە و کاتێك گەیشتە دەربار، بەهاوڕێکانی خۆی وت: ئەگەر ئێستاکە فەرمانڕەوایی بۆ ئێوە بەدەست نەهێنم ئیتر هیچ کات توانای ئەو کارەم نابێت. بەڕێکەوت تا گەیشتە لای یەزید کوڕی معاویە و پێی وت: هاوڕێ گەورە و دیارەکانی پێغەمبەر و بنەماڵە و گەورەکان و سەرانی قوڕەیش و یەکەم موسوڵمانەکان هەموویان مردون و تەنیا منداڵەکانیان ماوەتەوە و تۆ لەناو ئەوان لەپێشترین و بیرتیژترین و شارەزاترینیانی بۆ بەڕێوبردنی کاروباری وڵاتداری و شێوەی پێغەمبەری و نازانم سەرۆەری باوەڕداران لەچی دەترسێت کەبەیعەت بۆ تۆ وەرناگرێت. یەزید وتی: ئەم کارە بەکۆتایی دەگات؟ موغەیرە وتی: بەڵێ دەگات.
یەزید ڕۆشتە لای باوکی و لەوتەکانی موغەیرە ئاگاداری کردەوە. معاویە موغەیرەی بانگ کرد وپێی وت: یەزید چی دەڵێت؟ موغەیرە وتی: ئەی سەرۆەری باوەڕداران، تۆ بینیت دوای عوسمان چەندە خوێن ڕژان و ناسازگاری لەنێوان خەڵکدا ڕویدا. یەزید

جێگری تۆیە. بەیعەتی بۆ وەربگرە تا ئەگەر پێشهاتێك بۆ تۆ روبدات پشت و پنا و جێگری تۆ بێت و خوێن نەرژێت و ئاژاوە دروست نەبێت. معاویە وتی: لەم کارەدا کێ هاوکاری من دەکات؟ موغەیرە وتی: کوفە بۆ تۆ دەستەمۆ دەکەم و زیاد کوڕی ئوبیە بەسرە بۆ تۆ رازی دەکات. دوای ئەم دوشارە کەس نیە لەگەڵ تۆدا ناسازگاری بکات. معاویە وتی: بۆ سەرکارەکەی خۆت بگەڕێرەوە و لەمبارەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی دەیانناسی گفتوگۆ بکە تا تۆ دواهاتەکانی کار ببینیت و ئێمە کۆتایی کارەکە هەڵسەنگێنین.ماڵئاوایی لێکرد و بۆ لای هاورێکانی گەڕایەوە. وتیان: ها؟ وتی: پێی معاویەم بەزیانی ئۆمەتی محەممەد خستە ناو چاڵێکی خلیسك و قووڵ کەهەرگیز لێی نایێتەدەر و لەناو ئەوان کەلێنێکم دروست کرد کەهیچ کات چاك نابێتەوە. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێند:

بمثلی شاهدی النجوی و غالی بی الاعدا و الخصم الغضابا

یانی: کەسێکی وەك من بۆ وتنی قسە هێواش و لەسەرخۆکان دیاری مەکە، من روبەروی دوژمنە خراپەخوازەکان و مەترسیدارەکان بکەرەوە.

موغەیرە بەرێکەوت تا گەیشتە کوفە ولەگەڵ ئەو کەسانەی باوەڕی پێدەکردن و دیزانی لەگوێرایەڵانی بەنی ئومەییەن، سەبارەت بەکارەکەی یەزید راوێژی کرد. ئەوان رازی بون بەیعەتی لەگەڵ بکەن. لەناو ئەوان دە کەس یا زیاتری رەوانەی دەرباری معاویە کرد و سی هەزار دەرەمی پێدان و کوڕەکەی موسا کوڕی موغەیرەی کردە سەرکردەی ئەوان. ئەوان رۆشتنە لای معاویە و بەیعەت لەگەڵ یەزیدیان لەچاوەکانیدا رازاندەوە و داوایان لێکرد ئەو کارە بەکۆتایی بگەیێنێت. معاویە وتی: هەوڵ بۆ ئاشکرا کردنی ئەم نهێنیە مەدەن و لەسەر بۆچونەکەی خۆتان سوربن. دواتر بەموسای وت: باوکت دینی ئەوان بەچەندە کڕیەوە؟ وتی: بەسی هەزار. معاویە وتی: دین لای ئەوان زۆر لاواز بوە.

دەستەیەك دەڵێن: چل پیاوی رەوانە کرد و کوڕەکەی عوروەی کردە سەرکردەی ئەوان. کاتێك رۆشتنە لای معاویە، وتارێکیان پێشکەش کرد و وتیان: لەبەر ئەوە ئێمەیان رەوانە کردەوە تا سەیر کاروباری ئۆمەتی محەممەد بکەین. وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، تەمەنی تۆ درێژ بۆتەوە و ئێمە دەترسین کاروبارەکان لەیەك بپچڕێت. بۆ

ئێمە نیشانەیەك دابنێ وسنورێك دیاری بکە. وتی: بۆچونی راست بەمن بڵێن: وتیان: پێمان باشە یەزید کوڕی سەروەری باوەڕداران وەك جێگر دەست نیشان بکەیت. معاویە وتی: ئەو پەسەند دەکەن؟ وتیان: بەڵێ. وتی: ئەمە بۆچونی ئێوەیە؟ وتیان: بەڵێ و بۆچونی ئەو کەساندیە کەئێمەیان رەوانە کردوە. معاویە بەنهێنی لەعوروەی پرسی: باوکت دینی ئەوانی بەچەند کڕیوەتەوە؟ وتی: بەچوارسەد دینار. وتی: ئەو تێگەیشت کەدینەکەیان لەبەرچاویان هەرزانە. بەوانی وت: لەپێشنیارەکەی ئێوە دەکۆڵینەوە و خوا فەرمانی خۆی رەوا دەکات و خۆراگری باشترە لەپەلە کردن. ئەوان گەڕانەوە.

بۆچونی معاویە بۆ وەرگرتنی بەیعەت لەگەڵ یەزید بەهێز بو. ئەو کەسی بۆ لای زیاد کوڕی ئوبیە رەوانە کرد و پرسیاری لێکرد تا بزانێت بۆچونی لەمبارەوە چیە. زیاد عوبەید کوڕی کەعبی نومەیری بانگ کرد و پێی وت: هەر راوێژکارێك شیاوی بڕوا پێکردنە و هەر نهێنیەك شوێنێکی هەیە بۆ پاراستن. خەڵکان بەهۆی دوکارەوە لەزەوی دەدرێن: ئاشکرا کردنی نهێنی و ئامۆژگاری وەرگرتن لەکەسێك کە شیاو نیە. شوێنی نهێنی لای دو دەستە لەخەڵکانە: پیاوانی ئەو دنیا کەتەنیا چاو دەبڕنە پاداشتەکەی و پیاوانی ئەم دنیا کەکردارێکی رێزدارانەیان لەناخدایە و ئاوزێك بۆ پاراستنی پێگەکەی خۆیان. من ئەمانەم لەتۆدا بەدی کرد و ئەزمونم کرد کەشیاوی بۆ هەر دوکیان. بۆ کارێك بانگم کردویت کەناتوانم بەنامە پێت بڵێم. سەروەری باوەڕداران سەبارەت بەفلاَن کار و فیسار کار نامەیەکی بۆ من نوسیوە و مەبەستیەتی لەمبارەوە راوێژ لەگەڵ من بکات. ئەو لە ڕەم کردنی خەڵکان دەترسێت و هیوای بەفەرمانبرداری ئەوانە. پەیوەندی ئایینی ئیسلام و موسوڵمانان کارێکی دژوار و ئەستەمە و یەزید گەنجێکە تەممەڵ و خۆش رابوێر و جیاواز لەوە ئارەزوی گەورەی راو کردنە. ئێستا تۆ برۆ لای سەروەری باوەڕداران و ئاماژە بەکارەکانی یەزید بدە و پێی بڵێ لەم کارەدا پەلە نەکات. باشترین شێوە بۆ ئەوەی بەمەبەست بگەیت، ئەوەیە کەپەلە نەکەیت چونکە بەدەست هێنانی شتێك بەماوەیەکەی زەمەنی زۆر، باشترە لەوەی بەخێرایی دەستت کەوێت وبەخێرایی لەدەستی بدەیت.

عوبەید کوڕی کەعب وتی: ئایا ناتوانرێت جگە لەمە کارێکیتر بکرێت؟ زیاد وتی: چ کارێك؟ کەعب وتی: بوچونی سەروەری باوەڕداران نەشێوێنیت و کوڕەکەی

لەبەرچاویدا ریسوا نەکەیت. من دەڕۆمە لای یەزید وپێی دەڵێم سەروەری باوەڕداران نامەیەکی بۆ تۆ نوسیوە و داوای راوێژ کردن لەتۆ دەکات، چونکە دەیەوێت بۆ فەرمانڕەوایی تۆ بەیعەت وەربگرێت. تۆ دەترسی خەڵك ناسازگاری بکەن چونکە رەخنەی زۆری لێ دەگرن. تۆ بەباشی دەزانی دەست لەکارەکانی خۆی هەڵگرێت تا بەڵگە لەبەرژەوەندی ئەو لای خەڵك بە هێز بێت وئەوەی دەتەوێت بەئەنجام بگات. بەم شێوەیە، هەم چاکەخوازیت لەسەروەری باوەڕداران دریغ نەکردوە و هەم لەترس بۆ کۆتایی کاری خەڵك ئاسودە بویت. زیاد کوڕی ئوبیە پێی وت: ناوەڕاستی نیشانەکەت پێکا. برۆ لەژێر سێبەری خۆشەویستی خوا. ئەگەر سەرکەوتیت کارێکە بەخراپەی تۆی دانانێن و ئەگەر ناڕاست بێت تۆ دەغەڵ کاریت نەکردوە. تۆ ئەوەی دەیزانی، راشکاوانە باسی دەکەیت و خوا ئەوەی لەنهێنی دەیزانێت، رەوای دەکات.

عوبەید کوڕی کەعب ڕۆشتە لای یەزید وئەوەی بۆ زیاد کوڕی ئوبیەی باس کردبو، پێی وت. ئەو دەست بەرداری زۆر لەکارەکانی خۆی بو. زیاد لەگەڵ ئەودا نامەیەکی بۆ معاویە نوسی و داوای لێکرد خۆڕاگر بێت وپەلە نەکات. معاویە رازی بو.

کاتێك زیاد مرد، معاویە بڕیاریدا بەیعەت بۆ کوڕەکەی وەربگرێت. بۆ عەبدالله کوڕی عومەر سەد هەزار دەرهەمی رەوانە کرد و پێی رازی بو. کاتێك باسی بەیعەت لەگەڵ یەزید کرا، کوڕی عومەر وتی: مەبەستی ئاخی ئەم پیاوە، ئەوەیە کە دینەکەم لای من ئەرزانە. عەبدالله رازی نەبو.

دواتر معاویە بۆ مەروان کوڕی حەکەم نامەی نوسی: من پیر بوم و ئێسقانەکانم نەرم بون و دەترسم ئۆمەت دوای من گیرۆدەی ناسازگاری ببن. بەباشم زانی بۆ ئەوان کەسێك دەست نیشان بکەم کەدوای من کاروبارەکانی ئەوان راپەڕێنێت. نەمویست بێ راوێژ کردن لەگەڵ تۆ هیچ کارێك بکەم. ئەم کارە بەخەڵکی ئەو دیارە پێشنیار بکە و لەبۆچونەکانی ئەوان ئاگادارم بکەرەوە. مەروان لەناو خەڵك وتارێکیدا وئەوانی ئاگادار کردەوە. خەڵك وتیان: بەمەبەستەکەی گەیشت و بەختەوەر بو و کارێکی باشی کرد. ئێمە دەمانویست کەسێك هەڵبژێرێت و لەم کارەدا لاوازی نیشان نەدات.

مەروان ئەمەی بۆ معاویە نوسی. معاویە وەڵامی دایەوە و ناوی یەزیدی هێنا. مەروان لەناو خەڵك وتاریدا و وتی: سەروەری باوەڕداران کەسێکی بۆ ئێوە دیاری کردەوە و

سستی و لاوازی لەخۆی نیشان نەداوە. ئەو دوای خۆی کوڕەکەی یەزیدی کردۆتە فەرمانڕەوا.

عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر هەستا و وتی: ئەی مەروان، تۆ درۆت کرد و معاویەیش درۆی کرد. ئێوە خوازیاری باشە و چاکەی ئۆمەتی محەممەد نەبون. ئێوە دەتانەوێت ئەم کارە بۆ پاشایەتی بگۆڕن تا هەر پاشایەك کەمرد کوڕەکەی جێگەی بگرێتەوە. مەروان وتی: ئەم پیاوە ئەو کەسەیە کەخوا لەبارەوەی فەرمویەتی:ئەوەی بەدایك و باوکی وت: تف لەئێوە! ئایا مژدەی ئەوەم پێ دەدەیت کەلەرۆژی کۆتایی زیندو بکرێمەوە؟ چەندین سەدە پێش من تێپەڕی کردوە و کەس لەو دنیا نەگەڕاوەتەوە. ئەو دوانە فریاد خوازی دەبنە دەرگایی خواوەند و دەڵێن: هاوار لەتۆ! باوەڕ بێنە چونکە مژدەی خوا راست و دروستە. بەڵام ئەو دەڵێت: ئەمانە جگە لەئەفسانەی پێشینان هیچیتر نیە (احقاف ٤٦/ ١٧).

عایشە وتارەکەی بیست. لەپشت پەردەکەوە هەستا و هاواری کرد: ئەی مەروان، ئەی مەروان، خەڵك بێدەنگ بون، مەروان ئاوڕی دایەوە. عایشە وتی: ئەوە تۆ بویت بەعەبودلرەحمانت وت قورئان لەبارەی ئەو دابەزیوە؟ درۆت کرد! ئەو فلان کوڕی فلانە و تۆ لەتێکیت کە لەنفرینی پێغەمبەری خوا بۆ سوچێك فڕێدراویت.

حسین کوڕی عەلی هەستا و بەتەواوی دژایەتی ئەم کارەی کرد. عەبداللە کوڕی عومەر و عوبەیداللە کوڕی زوبەیریش هەستان و دژایەتیان کرد. مەروان ئەم هەواڵانەی بۆ معاویە نوسی. معاویە بۆ فەرماندارەکان و کارگوزرانی خۆی نوسیبو یەزید لەبەرچاوی خەڵك بەچاك و شیاو نیشان بدەن و وەسفی بکەن و دەستەی نوێنەرایەتیەکان لەشارەکانەوە بۆ دەرباری ئەو رەوانە بکەن. لەناو ئەو کەسانەی ڕۆشتنە دەرباری ئەو، محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم لەمەدینە و ئەحنەف کوڕی قەیس لەخەڵکی بەسرە. محەممەد کوڕی عەمرۆ لەبەرابەر معاویە هەستا و وتی: ئەی معاویە، هەر شوانێك پرسیار لە ڕانەکەی خۆی دەکات، بزانە سەررشتەی کاروبارەکانی ئۆمەتی محەممەد بەکێ دەسپێریت. معاویە بەشێوەیەکی لێهات دەتوت قورگی دەگوشن و لەرۆژێکی فێنکی زستان هەناسە دەکێشێت و دەیداتەوە. دواتر دیاری پێ بەخشی و بەرێی کرد. فەرمانی بەئەحنەف کوڕی قەیس دا بڕواتە لای یەزید. کاتێك لای ئەو

هاتەدەر، پرسیاری لێکرد: کوڕی براکەتت چۆن بینی؟ ئەحنەف وتی: ئەوەی بینیم گەنجی بو و چالاکی وسەرخۆشی و خۆشی.

کاتێك دەستە نوێنەرایەتیەکان لای ئەو کۆبونەوە، معاویە بەزوحاك کوڕی قەیسی فێهری وت: من قسە دەکەم و کاتێك بێدەنگ دەبم تۆیت خەڵك بۆ بەیعەت لەگەڵ یەزید بانگ دەکەیت و من بۆ ئەم کارە هان دەدەمیت. کاتێك معاویە لای خەڵك دانیشت، دەستی بەقسە کرد و ئاماژەی بەکاروباری ئیسلام و رێزداری خەلافەت و مافی خەلافەت کرد و باسی ئەوەی کرد کەخوا فەرمانی داوە خەڵك لەفەرمانڕەواکانی خۆیان فەرمان ببەن. دواتر باسی یەزیدی کرد و ئاماژەی بەلەپێشی و زانایی و توانایی وڵات بەرێوبردنی کرد و سوکە ئاماژەیەکی بۆ بەیعەتدان بەزید باس کرد. زوحاك قسەکەی بڕی. سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵك لەدوای تۆ ناچار دەبێت فەرمانڕەوایەکیان هەبێت. ئێمە کۆمەڵانی خەڵك و سازکاری ئەوانمان لەگەڵ یەك ئەزمون کردوە و بینیمان ئەم کارە زیاتر لەهەر کارێك خوێنە رێزدارەکان دەپارێزێت و ئاژاوە و فیتنە ناهێڵێت، رێگاکان ئەمن و ئەنجامێکی باشی لێدەکەوێتەوە. رۆژەکان دەڕۆن و دێن و خواوەند بۆ هەر رۆژە و فەرمانێکی هەیە. یەزید کوڕی سەروەری باوەڕداران بەکردار و ئاکاری راست و دروست بەشێوەیەکە کە تۆخۆت باشتر لەهەموان دەزانیت. ئەو لەروانگەی زانست و خۆراگری لەهەمومان لەپێشتر و لەروانگەی ئەندێشەوە، لەهەموان دورئەندێشترە. کاروباری فەرمانڕەوایی دوای خۆت بەو بسپێرە و ئەو لەدوای خۆت بکەرە رێنیشاندەری و پشتی ئێمە تا لەسێبەری ئەودا ئارام و ئاسودە بین.دوای ئەو عەمرۆ کوڕی ئەشەدەق وتارێکی خوێندەوە و هاوشێوەی زوحاك قسەی کرد. دواتر یەزید کوڕی موقەنەعی ئەلعوزری هەستا و وتی: سەروەری باوەڕداران ئەمەیە (معاویەی نیشاندا). ئەگەر بمرێت ئەمەیە (یەزیدی نیشاندا) و هەر کەس رازی نەبێت روبەروی ئەمە دەبێتەوە (شمشێرەکەی نیشاندا). معاویە وتی: دانیشە تۆ سەروەری وتاردەرانی.

معاویە بەئەحنەفی وت: ئەی ئەبوبەحر تۆ دەڵێیت چی؟ ئەحنەف وتی: ئەگەر راستی بڵێم لەئێوە دەترسم و ئەگەر درۆ بکەم لەخوا دەترسم. ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ لەیەزید و شەو و رۆژ و نهێنیەکان و ئاشکراکانی ئەو ئاگاداریت. ئەگەر ئەو بەهۆکاری

رەزامەندی خوا و ئۆمەتەکەی دەزانی، سەبارەت بەو دانانی ئەو راوێژ مەکە. ئەگەر جیاواز لەمەیە، باوەش بۆ ئەم دنیایە مەکەرەوە چونکە تۆ بۆ ئەو دنیا کۆچ دەکەیت. ئەرکی سەرشانی ئێمەیە بڵێین: بیستمان و فەرمان دەبەین. لەم کاتەدا پیاوێك لەخەڵکانی شام هەستا و وتی: ئێمە نازانین خەلفکانی مەعد و عێراق چی دەڵێن. ئەوەی ئەرکی سەرشانی ئێمەیە: گوێرایەڵی و فەرمانبردن و هێرش کردنە سەر دوژمنەکانی تۆیە.

خەڵك بڵاوەیان لێ کرد و وتەکانی ئەحنەفیان دەهێنایەوە سەرزمان. معاویە زێر و زیوی بەکەسانی نزیك دەبەخشی و لەگەڵ کەسە دورەکان بەنەرمی هەڵس وکەوتی دەکرد تا ئەوەی زۆرینەی خەڵك دەستەمۆ بون و لەگەڵ یەزید بەیعەتیان کرد. کاتێك عێراقیەکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد و خەڵکانی شام بێ چەند و چون شوێنی کەوتن، هاورێ لەگەڵ هەزار سوار بەرەو حیجاز بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە نزیکی مەدینە، پێش هەر کەسێك چاوی بەحسین کوڕی عەلی کەوت. بەخۆی وت: ئەی معاویە: نە بۆ شوێنێکی خۆش هاتویت نەبۆ زەمینێکی فراوان. قوربانیەکان دەبینم کەخوێنیان هاتۆتە کوڵ و خواوەند دەیانبارێنێت! حسین وتی: بێدەنگ بە، من شیاو نیم بۆ ئەم ژاوەژاوەی تۆ! کوڕی ئەبوسوفیان وتی: لەوەیش مەترسیدارتری! چاوی بەعەبدالله کوڕی زوبەیر کەوت و وتی: ناخۆش و ناناشنایت! مارمێلکێکی فێڵباز و فریوکارە کەسەری لەکونەکەی خۆی دەرهێناوە. هەندێ کات سەری دەباتە ژوور و کلکی لەدەرەوە دەهێڵێتەوە. سوێند بەخوا ئەوەندەی نەماوە کلکی بگرن و پانی بکەنەوە. ئەو لەمن دوربخەنەوە. دواتر قامچیەکی لەروخساری چوارپێکەی دا و دورکەوتەوە. دواتر چاوی بەعەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر کەوت. معاویە پێی وت: ناخۆشیت و بۆ شوێنێکی بەربڵاو هاتویت! پیرەپیاوێکی خڵەفاوە کەناوزی لەدەست داوە. دواتر فەرمانیدا و روخساری وشترەکەی ئەویان شکاند. ئەم کارەی لەگەڵ عەبدالله کوڕی عومەریش کرد. ئەوان لەگەڵ بەرێکەوتن و ئەو روی تێنەکردن تا ڕۆشتە ناو مەدینە. ڕۆشتنە بەردەم دەرگای بارەگاکەی، بەڵام معاویە رێگەی چونە ژورەوەی پێ نەدان. ئەوان چاکەیان لەو نەبینی و ئەوەی چاوەڕوانیان دەکرد، نەهاتەدی. هاتنەدەر و بۆ مەککە ڕۆشتن و لەوێ نیشتەجێ بون. معاویە لەمەدینە وتارێکی پێش کرد و ئاماژەی

بەیەزیددا و وەسفی کرد و وتی: چ کەسێك بەهەمو لەپێشی و زانایەی کەیەزید هەیەتی، لەو شیاوترە بۆ خەلافەت. من چاوم بەهەندێ کەس کەوت کەگومانم نیە بێنە سەر رێگەی راست مەگەر ئەوەی تۆفانە بەهێزەکان لەسەریان هەڵکات و لەناویان بەرێت. من ئاگاداری پێویستم دا ئەگەر ئاگادار کردنەوەیان بەس بێت. دواتر ئەم هۆنراوانەی خوێندەوە:

قد كنت حذرتك آل المصطلق و قلت يا عمرو اطعنى و انطلق

انك ان كلفتنى مالم اطق ساءك ما سرك منى من خلق

دونك ما استسقيته فاحس و ذق

یانی: من تۆ ئاگادار کردبویەوە کەزیان لەبنەماڵەی موستەلیق نەدەیت. بەتۆم وت. ئەی عەمرۆ لایەنگری لەمن بکە و فەرمانەکانی من ببیستە و شوێن کاری خۆت بکەوە. ئەگەر من بۆ کارێك دەست نیشان دەکەیت کەتوانایی ئەنجامدانیم نیە، هەمو عادەتە باشەکانی من کەدەبونە هۆکاری شادمانی تۆ دەبنە هۆی زیان و ئازاری تۆ. ئێستا، سەرقاڵی ئەو ئاوە بە کەلەچاڵەکە دەرتهێنا، بیچێژە و بیخۆرەوە.

دواتر رۆشتە لای عایشە. عایشە پێشتر ئاگادار ببویەوە کەمعاویە حسین و کەسانیتر بینیوە و وتویەتی: ئەگەر بەیعەت نەکەن بێ گومان دەیانکوژم. معاویە گلەیی لەحسین و کەسانیتری بردە لای عایشە. عایشە ئامۆژگاری کرد و وتی: بیستومە ئەوانت لەمەرگ ترساندوە. معاویە وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، ئەوان بەرێزتر لەوەن. بەلآم من بەیعەتم لەگەڵ یەزید کردوە و کەسانیتریش بەیعەتیان کردوە. ئایا بۆچونی تۆ ئەویە ئەم بەیعەتە هەڵبوەشێنمەوە؟ عایشە وتی: لەگەڵ ئەوان بەنەرمی هەڵس کەوت بکە کە بەخواستی خوا بەمەبەستەکەی خۆت دەگەیت؟. معاویە وتی: ئەو کارە دەکەم. لەقسەکانی عایشە بۆ معاویە ئەمە بو: تۆ ئەو کارەت لەگەڵ براکەم کرد (محەممەد کوڕی ئەبی بەکرت کوشت) ئێستا ناترسیت کەسێك لەسەر رێگەی تۆ دانێم تا بتکوژێت؟ معاویە پێی وت: هەرگیز، ئەی دایکی باوەڕداران. من لەشار و ماڵە پارێزراوەکاندا ژیان بەسەردەبەم. عایشە وتی: راستە.

معاویە تا ئەو جێگەی خوا دەیویست، لەمەدینە مایەوە. دواتر بەرەو مەککە بەرێکەوت. خەڵك پێشوازیان لێکرد. ئەو چەند کەسە وتیان: دەڕۆینە لای، ئەگەری

هەیە لەکردەکەی خۆی پەشیمان بوبێتەوە. ئەوان لە (بطن مر) چاویان پێی کەوت. یەکەم کەس کەڕۆشتە بینینی، حسین کوڕی عەلی بو. معاویە پێی وت: سلاو لەتۆ، بەخێر بێیت ئەی کوڕی پێغەمبەری خواوەند و سەروەری گەنجەکانی ئیسلام! فەرمانیدا چوارپێیەکیان بۆ حسین کوڕی عەلی هێنا تا سواری بێت و معاویە چەندین هەنگاوی گەورە هاورێیەتی کرد. دواتر ئەم کارەی لەگەڵ کەسانیتریشدا کرد. جگە لەوان کەس هاورێیەتی نەکرد تا گەیشتە ناو مەککە. ئەوان یەکەم کەسان بون ڕۆشتنە لای و دوایین کەسان بون لای ئەو ڕۆشتن. هیچ ڕۆژێك تێپەڕی نەدەکرد مەگەر ئەوەی دیاری پێدەبەخشین و هیچی بەوان نەدەوت. تا ئەوەی ڕێ و ڕەسمی بارەگایی خوایی بەجێ هێنا و بارەکانیان بەست و کاتی ڕۆشتنی نزیك کەوتەوە. یەکێك لەو چەند کەسە وتی: فریوی ئەو مەخۆن چونکە ئەم کارانە لەڕوی هاورێیەتیەوە نیە، تەنیا بۆ گەیشتن بەمەبەستەکەی ئەم هەڵس و کەوتەی گرتۆتەبەر. ئەوان وەڵامێکیان ئامادە کرد و هاودەنگ بون لەسەر ئەوەی عەبداللە کوڕی زوبەیر قسە کردن دەست پێبکات.

معاویە ئەوانی بانگ کرد و وتی: ئێوە هەڵس و کەوتی منتان لەگەڵ خۆتان بینی کەپەیوەندی خزمایەتیم لەگەڵ ئێوە بەهێز کرد و ئەوەی دەیزانن بەئێوەم بەخشی و چاکیەکانی خۆم پێشکەش بەئێوە کرد. یەزید برا و کوڕە مامی ئێوەیە، دەمەوێت وەك خەلیفە پێی رازی ببن و دوای ئەو ئێوەدەبن خەڵك لەسەر کار لادەبەن و فەرمانڕەواکان دەست نیشان دەکەن و سامانەکان بەدەست دێنن و کۆیان دەکەنەوە و هیچ کەس لەگەڵ ئێوە ناسازگاری ناکات. ئەوان بێدەنگ بون. معاویە وتی: ئایا وەڵامم نادەنەوە؟

دواتر رویکردە عەبداللە کوڕی زوبەیر و وتی: ئەوەی دەتەوێت بیهێنە سەر زمان، چونکە سوێند بەگیانی خۆت، تۆ قسەکەری ئەوانیت. کوڕی زوبەیر وتی: لەنێوان هەڵبژاردنی سێ کار سەرپشکت دەکەین: یا ئەو کارەبکە کەپێغەمبەری خوا کردی، یا ئەو کارە بکە کەئەبوبەکر کردی یا ئەو کارەی کەعومەر. معاویە وتی: چیان کرد؟ کوڕی زوبەیر وتی: پێغەمبەر چاوی لەجیهان پۆشی بێ ئەوەی کەس وەك جێگری خۆی دەستنیشان بکات و خەڵك ئەبوبەکەریان هەڵبژارد. معاویە وتی: لەناو ئێوەدا کەس وەك ئەبوبەکر نیە و من دەترسم خەڵك دوای من گیرۆدەی ناسازگاری ببن.

وتیان: راست نەکەیت. کەواتە ئەو کارە بکە کەئەبوبەکر کردی چونکە ئەو فەرمانڕەوایی بەکەسێکی دور لەقورەیشیەکان سپارد نەك یەکێك لەمناڵەکانی باوکی. ئەگەر دەتوێت ئەو کارە بکە کەعومەر کردی کەشەش کەسی بۆ راوێژ کردن دەست نیشان کرد کەهیچ کام لەمناڵەکانی خۆی یا باوکی لەناویاندا نەبون. معاویە وتی: جگە لەم قسانە، قسەی دیکەت پێیە؟ وتی: نە. دواتر پرسی: ئەی ئێوە؟ وتیان: وتارەکەی ئەو پشت راست دەکەینەوە. وتی: حەزم دەکرد لەگەڵ ئێوەدا نزیك بم ( یا حەزم دەکرد لەگەڵ ئێوەدا راوێژ بکەم). ئەوەی لەپێشەوە ئاگاداری دابێت، داوای لێبوردنی کردوە. من پێشتر هەڵس وکەوتێکم بو کە لەناو ئێوەدا وتارم پێشکەش دەکرد و دواتر یەکێك هەڵدەستا و لەبەرابەر چاوی هەموان شەڕی لەگەڵ من دەکرد و منی بەدرۆزن دادەنا. من ئە م بارە قورسەم بەشانی خۆم هەڵدەگرت و لێی خۆش دەبوم. ئێستا دەمەوێت لێرەدا وتارێك پێشکەش بکەم. سوێند بەخوا ئەگەر لەم شوێنەدا کەسێك وتارەکەم پشت راست نەکاتەوە و یەك وشەی دیکە بێنێتە سەرزمان، شمشێر سەری لەجەستە جیا دەکاتەوە. پارێزگاری لەگیانی خۆتان بکەن.

دواتر سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی بانگ کرد و وتی: لەسەر هەر کام لەمانە دوپیاوی شمشێر بەدەست دابنێ و ئەگەر یەکێکیان ویستی قسەکانی من بەراست بزانێت یا رەدیان بکاتەوە، ئەو دوانە بەشمشێر لێی بدەن. دواتر ڕۆشتەدەر و ئەوان لەگەڵی ڕۆشتنە دەر تا گەیشتە سەر تەختی وتاردان و سوپاس و وەسفی خوای بەجێهێنا و دواتر وتی: ئەو کەسانەی لێرەن سەروەری موسوڵمانان و هەڵبژێردراوی ئەوانن. کار بێ راوێژ کردنی ئەوان بەکۆتایی ناگات. ئەوان رازی بون و بەیعەتیان کرد. ئێوەش بەناوی خوا بەیعەت بکەن. خەڵك کەچاوەروانی بەیعەتی ئەوان بون، بەیعەتیان کرد. دواتر سوار بو و بەرەو مەدینە بەرێکەوت. خەڵك چاویان بەو چەند کەسە کەوت و وتیان: گومانمان دەکرد بەیعەت ناکەن، بۆ رازی بون و دیاریتان وەرگرت و بەیعەتتان کرد. وتیان: سوێند بەخوا بەیعەتمان نەکردوە. پرسیان: بۆ رەدی قسەکانی ئەم پیاوەتان نەدایەوە؟ وتیان: فێڵی لێکردین و ئێمە ترساین بکوژرێین.

خەڵکانی مەدینە بەیعەتیان لەگەڵ کرد و دواتر معاویە بەرەو شام بەرێکەوت و

بەخششەکانی لەبەنی هاشم گرتەوە. عەبداللە کوڕی عەباس ڕۆشتە لای و پێی وت: بۆ بەخششەکانی بەنی هاشمت بڕیوە؟ معاویە وتی: سەرومری ئێوە لەگەڵ یەزید بەیعەتی نەکرد و ئێوە هیچتان پێ نەوت و سەرکۆنەتان نەکرد. کوڕی عەباس وتی: ئەی معاویە، شیاوە بۆمن بڕۆمە کەنارەکان و ئەوەی دەیزانی، بەخەڵك بڵێم و خەڵکان دژی تۆ ڕاپەڕێنم. وتی: ئەی ئەبو عەباس، بەخشش و بەشی ئێوە دەدەم و ڕازیتان دەکەم و ئاوڕتان لێ دەدەمەوە.

دەستەیەك دەڵێن: عەبداللە کوڕی عومەر بەمعاویەی وت: لەسەر ئەو بنەمایە بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکەم تا بەوەی خەڵك پێی ڕازی دەبن، ڕازی دەبم. سوێند بەخوا ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشیان هەڵبژارد، ڕازی دەبم. دواتر ڕۆشتە ماڵەوە و دەرگای لەسەر خۆی داخست و ڕێگەی بەکەس نەدا بڕواتە لای.

من دەڵێم: ئاماژەدان بەوتەی عەبدەلرەحمان کوڕی ئەبی بەکر لەگەڵ وتەی ئەو کەسەی مردنی ئەو لەساڵی ٦٧٣/٥٣ زایینی دادەنێت، یەك ناگرێتەوە. لەگەڵ وتاری کەسێکدا یەك دەگرێتەوە کە مێژوی مردنەکەی لەدوای ئەم بەروارە دەزانێت.

## لابردنی عوبەیدالله کوڕی زیاد لەخوراسان

دانانی سەعید کوڕی عوسمان کوڕی عەففان

لەم ساڵەدا معاویە سەعید کوڕی عوسمان کوڕی عەففانی کردە فەرمانڕەوایی خوراسان و عوبەیدالله کوڕی زیادی لەسەر کار لابرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبو سەعید داوای لەمعاویە کرد وەك فەرمانڕەوایی خوراسان دیاری بکات. معاویە وتی: عوبەیدالله کوڕی زیاد لەوێیە. سە عید وتی: سوێند بەخوا باوکی من بو تۆی پەروەردە کرد و گەورەی کرد و بەهاوکاری ئەو گەیشتیتە ئەم پێگەیە کەهیچ کەس ناتوانێت بەرابەری تۆ بکات. ئەسوپاسی رەنجی ئەوت کرد و نە پاداشی کارەکەیت دایەوە و ئەم کوڕەت (یەزید) هێنایە سەر تەخت و بەیعەتت بۆ وەرگرت. سوێند بەخوا لەروانگەی دایك و باوك و خۆمەوە لەو لەپێشترم. معاویە وتی: رەنج بردنی باوکت بۆ پەروەردە کردنی، شیاوە پاداشتەکەی وەربگریت بەلآم بزانە یەکێك لەپاداشتە گەورەکانی من ئەوەبو کەداوای خوێنی ئەوم کرد. راستە کەباوکی تۆ لەپێشترە لەباوکی یەزید و عوسمان لە من (معاویە) گەورەترە. بەلآم لەپێشی دایکی تۆ لەدایکی ئەو، ئەمەیشە راستە چونکە ژنێکی قوڕەیشی باشترە لەژنێکی کەلبی. بەلآم لەپێشی خۆت لەیەزید، سوێند بەخوا هیچ کات ئارەزوی ئەوەم نیە گێژاوی دیمەشق پڕ ببێت لەپەرستارەکانی یەزید کەهاوشێوەی تۆ بن. یەزید پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران کوڕە مامی تۆیە و تۆ شیاوترین کەسیت لەکاروبارەکانی بڕوانیت، گلەیی لەتۆ کرد، ئارەزوەکەی بەدی بێنە.

معاویە ئەوی وەك سەرکردەی کاروباری جەنگی خوراسان و ئیسحاق کوڕی تەڵحەی وەك سەرپەرەستی کۆکردنەوەی باج دەستنیشان کرد. کوڕی ئیسحاق کوڕە پوری معاویە بو چونکە دایکی دایکی ئەبان کچی عوتبە کوڕی رەبیعە بو. کاتێك گەیشتە رەی، مرد و سەعید لێپرسراویتیەکەی ئەویشی گرتە دەست. کاتێك گەیشتە خوراسان، روباری بڕی و خۆی گەیاندە سەمەرقەند. خەڵکانی سەغد روبەروی بونەوە. رۆژێك تا شەو چاوەڕوانیان کرد و شەڕیان دەست پێنەکرد. مالك کوڕی ریب وتی:

مازلت یوم الصغد ترعد واقفا     من الجبن حتی خفت ان تتنصرا

یانی: لەرۆژی شەڕی لەگەڵ خەڵکانی سەغد، لەترسا لەجێگەکەی خۆت وەستایت و لەرزایت بەو رادەی کەترسام ئایینی مەسیحی هەڵبژێریت.

کاتێك بەیانی بویەوە، شەڕیان دەست پێکرد و سەعید ئەوانی تێکشکاند و لەشارەکەی خۆیان گەمارۆی خستە سەریان. ئەوان بەئاشتی پێشوازیان لێکرد و پەنجا کوڕی گەورەکانیان وەك بارمتە لای ئەو دانا. ئەو ڕۆشتە تەرموز و بەئاشتی دەستی بەسەردا گرت. پەیمانەکەی لەگەڵ خەڵکی سەمەرقەند شکاند و کوڕەکانی هاوشێوەی کۆیلە هێنایە مەدینە. لەو کەسانەی لەگەڵ ئەودا کوژران، قوسەم کوڕی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب بو.

لەم ساڵەدا جویریە کچی حارس و هاوسەری پێغەمبەر مرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی پەنجا و حەوتی کۆچی( ٦٧٧ کۆچی )

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی قەیس زستانی لەسەرزەمینی ڕۆم بەسەر برد.
هەروەها لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم لەفەرمانداری مەدینە لابرا و وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی سوفیان جێگەی گرتەوە. دەستەیەك دەڵێن: مەروان لەم ساڵەدا لەسەر کار لانەبرا. لەم ساڵەدا ئایینی حەج لەلایەن وەلید کوڕی عوتبە ئەنجامدرا.
کارگوزارەکانی ئەم کەسانە بون: زوحاك کوڕی قەیس لەکوفە، عوبەیدالله کوڕی زیاد لەبەسرە و سە عید کوڕی عوسمان لەخوراسان.
هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: عەبدالله کوڕی عامر کە دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٥٩/ ٦٧٩ زایینی مرد، عەبدالله کوڕی قودامەی سەعدی کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو، دەستەیەك دەڵێن: نەژادنامەکەی بەم شێوەیە: عەبدالله کوڕی عەمرۆ کوڕی وەقدانی سەعدی، لەبەر ئەوە بەسەعدی ناوی دەبەن چونکە باوکی ژنێکی لەبەنی سەعد بۆ هێنا، ئەو لەبەنی عامر کوڕی لۆئەی بو. عوسمان کوڕی شەیبە کوڕی ئەبی تەڵحەی عەبدەری کەباوەگەورێی بەنی شەیبە دەرگاوانەکان و پەردەدارەکانی کەعبە بو و تا ئێستایش کلیلی کەعبە لەدەستی ئەواندایە. ئەو لەڕۆژی گرتنی مەککە یا لەڕۆژی حونەین باوەڕی بەئیسلام هێنا، جوبەیر کوڕی موتعەم کوڕی نەوفلی قورەشی کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو. دایکی سەلە هاوسەری پێغەمبەر کەدەستەیەك دەڵێن تا کاتی کوژرانی حسین کوڕی عەلی ژیا.

## رووداوەکانی ساڵی پەنجا و هەشتی کۆچی( ٦٧٨ زایینی )

لەم ساڵەدا مالك کوڕی عەبداللە خەسعەمی لەسەرزەمینی رۆم و عەمرۆ کوڕی یەزیدی جوهەنی و بوتەی دەستەیەك جونادە کوڕی ئەبی ئومەییە لەدەریا شەڕیان کرد.

## لابردنی زوحاك لەکوفە و دانانی کوڕی دایکی حەکەم

لەم ساڵەدا معاویە زوحاك کوڕی قەیسی لەکوفە لابرد و عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللە کوڕی عوسمانی سەقەفی ناسراو بەناوی کوڕی دایکی حەکەم (خوشکەزای معاویەی) وەك فەرمانداری ئەو دیارە دەست نیشان کرد.

لەکاتی ئەم فەرماندارەدا بو کەخەواریج شۆڕشیان کرد. ئەمانە ئەو کەسانە بون موغەیرە کوڕی شەعبە ئەوانی خستبوە زیندانەوە. حەییان کوڕی زەبیانی سەلەمی و موعاز کوڕی جومینی تایی ئەوانیان کۆکردەوە و قسەیان بۆ کرد و بۆ شەڕ لەرێگەی خوا هانیان دان. ئەوان لەگەڵ حەییان کوڕی زەبیان بەیعەتیان کرد و بەرەو بانقیا رۆشتنەدەر. سوپایەك لەکوفەوە روبەرویان بویەوە و هەموویانی کوشتار کرد.

دواتر خەڵکانی کوفە عەبدولرەحمان دایکی حەکەمیان بەهۆکاری کرداری وەحشیانە دەرکرد. ئەو پەیوەستی خاڵۆی یانی معاویە بو کە ئەوی وەك فەرمانداری میسر دەست نیشان کرد. معاویە کوڕی حودەیج لەدەرەوەی میسر پێشوازی لێکرد و پێی وت: بۆ لای خاڵۆت بگەڕێوەوە چونکە سوێند بەگیانی خۆم ناتوانیت ئەو کردارەی لەکوفە گرتە بەر، لای ئێمە دوبارەی بکەیتەوە. ئەو بۆ لای معاویە گەڕایەوە.

دواتر معاویە کوڕی حودەیج رۆشتە دیداری معاویە لەشام. هەرجار کەدەرۆشتە لای معاویە، رێگاکانی (قباب الريحان)یان بۆ دەرازاندەوە. رۆشتە لای معاویە و خوشکەکەی دایکی حەکەم لای ئەو بو. ژن پرسی: ئەی سەرورەری باوەڕداران، ئەمە کێیە؟ معاویە کوڕی ئەبو سوفیان وتی: بەبە! ئەمە معاویە کوڕی حودەیجە. ژن وتی: بەخێر نەیێت. ئەگەر ناوێك لەمەعیدی ببیستی باشترە لەوەی چاوت بەو بکەوێت. معاویە کوڕی حودەیج وتی: ئەی دایکی حەکەم، لەبەر چاوم ونبە. سوێند بەخوا شوت کرد و بەرێز نەبویت و سکت کرد و کوڕت نەهێنایە دونیا. ویستت کوڕە خراپەکارەکەیات بکەیتە

سەروەری ئێمە تا ئەو کارەمان لەگەڵ بکات کەلەگەڵ خەڵکانی کوفە کردی بەڵام خوا نەیهێشت ئەو رۆژە ببینێت. ئەگەر ئەو کارەی دەکرد لەگەڵ خاکدا یەکسانمان دەکرد هەرچەندە ئەم پیاوە (معاویە) پێی ناخۆش دەبو. معاویە کوڕی ئەبوسوفیان روی کردە ئەو ژنە و وتی: بەسە. ژن بێدەنگ بو.

## شۆڕشی تواف کوڕی غەلاق

کەسانێك لەخەواریج لەبەسرە لای پیاوێك بەناوی جەدار کۆدەبونەوە و گفتوگۆیان دەکرد و کارە قێزەونەکانی دام و دەزگایی فەرمانڕەوایەتیان دەست نیشان دەکرد. کوڕی زیاد ئەوانی خستە زیندان و دواتر بانگی کرد و فەرمانی پێدان یەکتر کوشتار بکەن و بکوژەکان ئازاد دەبن. ئەو کارەیان کرد و کوڕی زیاد ئەوانی ئازاد کرد. یەکێك لەبکوژەکان تەواف بو. هاورێکانیان ئەوانیان سەرکۆنە کرد و وتیان: براکوژیتان کرد! وتیان: ناچاربوین، هەندێ کات بەزۆر کەسێك لەدینەکەی هەڵدەگێرنەوە بەڵام دڵی لێوانلێوە لەباوەڕ. تەواف و هاورێکانی لەکردەکەی خۆیان پەشیمان بونەوە. تەواف وتی: هیچ رێگەیەکی گەڕانەوە بۆ لای خوا هەیە؟ ئەوان دەگریان. پێشنیاری خوێنباییان بەبنەماڵەی کوژراوەکان کرد کەرازی نەبون. بەوانیان وت: کوشتارمان بکەن. بەمەیش رازی نەبون. تەواف چاوی کەوت بەهەسهاس کوڕی سوری سەدوسی. لێی پرسی: ئایا هیچ رێگەیەکی گەڕانەوە بۆ ئێمە دەبینی تا بگەرێینەوە. وتی: جگە لەیەك ئایە لەنوسراوی خوای گەورە نابینم کەدەفەرمێت: خواوەندی تۆ بۆ ئەوانەی رێگەی کۆچیان گرتەبەر ودوای ئەو فریو دران و دواتر لەرێگەی خوادا شەڕیان کرد و خۆڕاگریان کرد، خواوەندی تۆ، دوای ئەوە میهرەبان و بەخشندەیە (نحل/١٩/١١٠). تەواف هاورێکانی خۆی بۆ شۆڕش هاندا تا کوڕی زیاد بەشێوەیەکی لەناکاو بکوژن. ئەوان لەساڵی ٥٨/ ٦٧٨ زایینی بەیعەیتان لەگەڵ کرد. حەفتا پیاو لەبەنی عەبدقەیس لەبەسرە بون. پیاوێك لەهاوەڵەکانی ئەم هەواڵانەی بەگوێی زیاد گەیاند. تەواف لەم کارە ئاگادار بویەوە و شۆڕشەکەی بەر لەکاتی دیاریکراو دەستپێکرد. هەمان شەو شۆڕشیان کرد و پیاوێکیان کوشت و رویان لە (جلحا) کرد. کوڕی زیاد پاسەوانانی بوخاری، سوخاری بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد کەشەڕیان لەگەڵ کرد و پاسەوانەکان

شكەستیان خوارد و گەڕانەوە بۆ ناو بەسرە و ئەوان شوێن تێكشكاوەكان كەوتن. ئەمە لەرۆژی جەژنی رۆژو شكاندن ٢٧ ژوئیەی ٦٧٨ زایینی رویدا. خەڵكانێكی زۆر خۆڕاگریان لەبەرابەر ئەوان دەست پێكرد و پەیوەستی شەڕەكە بون و خەواریجیان كوشتار كرد بەشێوەیەك تەنیا شەش كەس لەگەڵ تەواف مایەوە. ئەسپەكەی تینوبو و بەرەو ئاوەكە غاریدا و خەڵكانی بوخاری ئەویان بەزوبین تیرباران كرد و كوشتیان و دواتر بەدارەوە هەڵیانواسی. دوای ئەوە خەڵكەكەی دایان گرت و بەخاكیان سپارد. شاعیرەكەی ئەوان وتی:

یارب هب لی الفتی و الصدق فی ثبت      واكف المهم فانت الرازق الكافی
حتی ابیع التی تفنی باخرة      تبقی علی دین مرداس و طواف
و كهمس و ابی الشعثاء اذ نفروا      الی الاله ذوی اخباب زحاف

یانی: خواوەندا، بەهێزی و دروستی بەمن ببەخشە و كارە قورس و گرانەكان لەسەر شانی من هەڵبگرە چونكە تۆ رۆزیدەری. دەمەوێت ئەم جەستە لەناوچوە لەبەرابەر دنیایی هەمیشەیی بفرۆشم چونكە ئایینی مرداس و تەواف و كەهمس و ئەبی شەعسا ئەمەیە. ئەوانەی بەدەم هێرش كردن و بوێرانە رویان لەبارەگایی خوایی كرد.

## کوژرانی عوروە کوڕی ئودیە لەگەڵ خەواریجەکانی دیکە

لەم ساڵەدا عوبەیداللە کوڕی زیاد تەنگی بەخەواریج هەڵچنی و دەستەیەکی فراوانی لەوان کوشت. عوروە کوڕی ئودیە برای ئەبوبیلالی مرداس کوڕی ئودیە یەکێك بو لەوان. ئودیە ناوی دایکیان بو و باوکیان حودەیری تەمیمی بو.
هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بو کە کوڕی زیاد بۆ سەیرکردنی یاریزانانی ئەسپ سوار ڕۆشتبوە دەرەوەی شار. کاتێك دانیشت خەڵك لەدەوری ئەو کۆبونەوە و عوروە لەناویاندا بو. ئەو هاتەپێش و ئامۆژگاری کوڕی زیادی کرد و چەند ئایەیەکی لەقورئان بۆخوێندەوە: ئایا لەهەر شوێنێکی بەرز کۆشکێکی گەورە دروست دەکەن و تیایدا یاری دەکەن؟ و کۆشکە گەورەکان دروست دەکەن تا ئەمر و هەمیشەیی بن و کاتێك لێ دەدەن ستەمکارانە لێ دەدەن (شعرا ٢٦/١٢٨——١٣٠). کاتێك ئەمەی وت، کوڕی زیاد زانی ئەو بەدەستەیەك لەهاوڕێکانی خۆی پشت ئەستورە. لەشوێنەکەی هەستا و سوار و بو و سەیری ئەسپ سواریەکەی نەکرد. بەعوروەیان وت: بێ گومان تۆ دەکوژێت! ئەو خۆی شاردەوە و کوڕی زیاد بەدوایدا گەڕا. بۆ کوفە هەڵات و لەوێ دەسگیر کرا. بردیانە لای کوڕی زیاد کەفەرمانیدا دەست وپێیان بڕیەوە و هاوڕێ لەگەڵ کچەکەی سەریان بڕی.
براکەی ئەبوبیلالی مرداس کوڕی ئودیە پیاوێکی خۆپارێز و لەخواترس و لەناو خەواریج پێگەیەکی بەرزی هەبو. لەشەڕی صەفین هاوڕێیەتی عەلی کوڕی ئەبی تالبی کرد بەلآم هەڵبژاردنی داوەری بەناڕاست زانی و لەشەڕی نەهرەوان شان بەشانی خەواریج شەڕی کرد. هەمو خەواریج خۆشیان دەویست. عابایەکی لەبەر کوڕی عامردا بینی و پەسەندی نەکرد و وتی: ئەمە عابای خراپەکارانە! ئەبوبەکرە وتی: ئەمە سەبارەت بەپاشا مەڵێ چونکە هەر کەسێك پاشا بەدوژمن بزانێت، خواوەند ئەو بەدوژمن دەزانێت. ئەو باوەڕی بەم باوەڕی خەواریج نەبو کە دەبێت هەمو موسوڵمانان بێ پرسیار کردن لەکار و ئەندێشەی ئەوان کوشتار بکەن. هاتنەدەرەوەی ژنانی بەناڕەوا دەزانی و دەیوت: تەنیا لەگەڵ ئەو کەسەدا شەڕ دەکەین کەشەڕی ئێمە دەکات و تەنیا باج لەو کەسانە وەردەگرین کەپارێزگاریان لێ دەکەین.

ژنێك بەناوی بسجا لەبەنی یەربوع خەڵکی دژی کوڕی زیاد هان دەدا و ئاماژەی بەیاخیگەری و ستەمکاری ئەو دەکرد. ئەویان بەژنێکی تێکۆشەر ناودەبرد. ڕۆژێك کوڕی زیاد باسی ئەو ژنەی کرد. ئەبوبیلال وتی: خۆپارێزی (تقیه) کارێکی ناڕوا نیە. خۆت بشارەوە ئەی ژن چونکە ئەم پیاوە ستەمکارە ناوی تۆی هێنایە سەرزمان. وتی: دەترسم لەمن زیان بەکەسێك بگات. کوڕی زیاد ئەم ژنەی گرت و هەردو دەست و قاچی بڕیەوە. ئەبوبیلال لەبازارەوە تێپەڕی کرد و کاتێك ژنەکەی بینی ریشی خۆی بەدیان گرت و وتی: ئەی مرداس، ئەم ژنە مەرگی زیاتر لەتۆ خۆش دەوێت. چ مەرگێکی شکۆمەندانەتر لەمەرگی بسجا !ئەبوبیلالی مرداس لای وشترێکەوە تێپەڕی کرد کەبەقەتران شۆردبویان. بێهۆش کەوت و کاتێك هاتەهۆش، ئەم ئایەی خوێندەوە: پانتۆڵەکانیان لەقەترانە و ئاگر روخساریان دادەپۆشێت (ئیبراهیم/۱٤/٥۰).

دواتر کوڕی زیاد پێداگرانە شوێن خەواریج کەوت و زیندانەکانی لەوان پڕ کرد. بەردەوام خەڵکی بێ گوناهی دەگرت و ئەبوبیلالی مرداسی پێش کوشتنی براکەی خستە زیندانەوە. زیندانبان بینی ئەو بەردەوام خوا دەپەرستێت. لەبەر ئەمە فەرمانی پێدا شەوانە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی و بەیانیان بێتەوە بۆ زیندان. مرداس هاوڕێیەکی بو شەوانە لەگەڵ کوڕی زیاد بۆ شەونشینی دادەنیشت. شەوێك کوڕی زیاد ناوی خەواریجی برد و وتی بەیانی هەمویان کوشتار دەکەم. هاوڕێکەی ئەبوبیلال ڕۆشتە لای و ئاگاداری کردەوە. زیندانبان شەوێکی مەترسیداری بەسەر برد و ترسا مرداس ئەم هەواڵە ببیستێت و نەگەڕێتەوە. کاتێك کاتی گەڕانەوەی بەیانیانی هات، زیندانبان ئەبو بیلالی بینی بەرەو زیندان دێت. پرسی: مەگەر نازانی فەرماندار ئاهەنگی چی لەسەردایە؟ مرداس وتی: دەزانم. وتی: دەزانیت و گەڕاویتەوە؟ مرداس وتی: پاداشتی چاکەی تۆ ئەوە نیە لەجیاتی من سزا بدرێیت. لەکاتی بەیانیدا عوبەیدالله هەمو زیندانیەکانی خەواریجی بانگ کرد و کوشتاری کردن. کاتێك مرداسیان بەرەو کوشتن برد، زیندانبان کەهاوشیری عوبەیدالله بو، نێوەنجیگەری کرد و داستانەکەی ئەوی بەعوبەیدالله وت. عوبەیدالله مرداسی بەو بەخشی و ئازادی کرد.

دواتر ئەو ترسی کوڕی زیادی کەوتە دڵەوە و هاوڕێ لەگەڵ چل پیاو بەرەو ئەهواز

کەوتە ڕێ. لای هەر سامانێکی گەنجینەوە کەتێپەڕی دەکرد بەئەندازەی خۆی و هاوڕێکانی هەڵدەگرت و پاشماوەکەی دەگەڕاندەوە. کاتێك کوڕی زیاد هەواڵی ئەم کارەی بیست، لەساڵی ٦٨٠/٦٠ زایینی سوپایەکی بەسەرکردایەتی ئەسلەم کوڕی زەرعە کەلابی یا ئەبو حوصەینی تەمیمی ڕەوانە کرد. ژمارەی ئەم سوپایە دوهەزار پیاوی شەڕکەر بو. کاتێك ئەم سوپایە گەیشتە ئەبوبیلالی مرداس و هاوڕێکانی، ئەسلەم سوێندیدان شەڕ دەست پێبکەن بەڵام ئەوان ڕازی نەبون. ئەسلەم داوای لەخەواریج کرد بێنە ناو ڕیزی کۆمەڵانی خەڵکەوە. ئەوان ڕازی نەبون و وتیان: دەتەوێت ئێمە بۆ لای کوڕی زیادی خراپەکار ببەیت؟ هاوڕێیانی ئەسلەم یەکێك لەهاوڕێیانی مرداسیان بەتیر کوشت. مرداس وتی: ئەوان شەڕیان دەست پێکرد. خەواریج هاوشێوەی یەك کەس هێرشیان دەست پێکردو ئەوانیان تێکشکاند. هاوڕێیانی ئەسلەم هەڵاتن و تا بەسرە ئاوڕیان نەدایەوە. کوڕی زیاد سەرکۆنەی ئەسلەمی کرد و وتی: چل پیاوی شەڕکەر سوپا دوهەزار کەسیەکەی تۆی تێکشکاند، نابێت چاوەڕوانی هیچ چاکەیەك لەتۆ بکەین. ئەسلەم وتی: ئەگەر زیندوبم و سەرکۆنەم بکەیت باشترە لەوەی بمرم و وەسفم بکەیت. کار گەیشتە ئەوەی کاتێك مناڵانی بەسرە دەیانبینی، هاواریان دەکرد: هێی، ئەبوبیلال هات! ئەو گلەیی بردە لای زیاد. کوڕی زیاد فەرمانی دا دەستی لێ هەڵبگرن و دەستیان لێ هەڵگرت.

یەکێك لەخەواریج وتی:

| | |
|---|---|
| أ ألفا مومن منكم زعمتم | و يقتلهم باسك اربعونا |
| كذبتم ليس ذاك كما زعمتم | و لكن الخوارج مومنونا |
| هى الفئة القليلة قد علمتم | على الفئة الكثيرة ينصرونا |

یانی: ئایا دوهەزار پیاوی شەڕکەر لەنێوە کەئەوانتان بەخوا پەرەست دەزانی، لەئاسك لەسەر دەستی چل کەس کوشتار کران؟ درۆتان کرد، بەوشێوە نیە کەگومانتان کرد بەڵکو خەواریج خواپەرستن. ئەمانە ئەو تاقمە کەمەن (بەوتەی خوا لەقورئان) بەسەر دەستەیەکی گەورەدا زاڵبون.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێکی دیکە

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عوتبە ئاپینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: عوقبە کوڕی عامری جوهەنی کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو و لەگەڵ معاویە بەشداری شەڕی صەفینی کرد. عایشە علیها السلام، سەمورە کوڕی جوندەب کەچاوی بەپێغەمبەری خوا کەوتبو، مالك کوڕی عوبادە غافقی، عومەیرە کوڕی یەسربی دادیاری بەسرە کەهشام کوڕی هوبەیرە لەجێگەکەی دانرا.

## ڕوداوەکانی ساڵی پەنجا و نۆی کۆچی( ٦٧٩ زایینی )

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی مورە جوهەنی زستانی لەسەرزەمینی ڕۆم بەسەر برد و لەوشکایی شەڕی کرد و جونادە کوڕی ئەبی ئومەییە لەدەریا شەڕی دەست پێکرد. دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا لەدەریا شەڕی ڕوینەدا. هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی دایکی حەکەم لەکوفە لەسەر کار لابرا نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری جێگەکەی گرتەوە. پێشتر ئاماژەمان بەهۆکارەکەی دا. دەستەیەك دەڵێن: لەسەر کار لابردنی ئەو لەساڵی ٦٧٨/٥٨ زایینی ڕویدا.

## فەرمانڕەوایی عەبدولرەحمان کوڕی زیاد لەخوراسان

لەم ساڵەدا معاویە عەبودلرەحمان کوڕی زیادی لەخوراسان دانا و لەپێش ئەو قەیس کوڕی هەیسەمی سولەمی ڕەوانە کرد و ئەسلەم کوڕی زەرعەی گرت و خستیە زیندان و سێسەد هەزار درەمی لێ سەند. دواتر عەبدولرەحمان گەیشت. ئەو پیاوێکی ڕێزدار و تەماحکار و لاوازبو کەهەرگیز شەڕی نەکردبو. تا دوای کوژرانی حسین کوڕی ئەبی تالب لەخوراسان مایەوە. لەم کاتەدا بەبیست هەزار هەزار (بیست ملیۆن) ڕۆشتە لای یەزید کوڕی معاویە. یەزید وتی: ئەگەر دەتەوێت لێکۆڵینەوە لەکارەکانت دەکەین ونەوەی وەرت گرتوە لەتۆی دەستێنین و تۆ دەگەرێیننەوە بۆ سەر کارەکەت و ئەگەر بتەوێت، ئەوەی پێتە، بەتۆی دەبەخشین و لەسەر کار ناتهێڵین و تۆ پێنسەد هەزار درەم بە عەبداللە کوڕی جەعفەر دەبەخشیت. عەبدولرەحمان وتی: ئەوەی پێمە، بەمنی ببەخشە و لەسەر کار لامبەرە. ئەو کارەی کرد. عەبدولرەحمان یەك هەزار هەزار (یەك ملیۆن) درەمی بۆ عەبداللە کوڕی جەعفەر نارد و وتی: پێنسەد هەزاری یەزید و پێنسەد هەزاری خۆم.

## لەسەر کار لابردنی کوڕی زیاد لەبەسرە و گەڕاندنەوەی بۆ سەر کارەکەی

لەم ساڵەدا معاویە عوبەیداللە زیادی لەبەسرە هەڵگرت بەڵام دوبارە ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە.
هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە کوڕی زیاد هاوڕێ لەگەڵ گەورەکانی بەسرە، لەناو ئەوان ئەحنەف کوڕی قەیس، ڕۆشتە لای معاویە. کوڕی ئەحنەف هیچ پێگەیەکی لای زیاد نەبو بەڵکو بەپێچەوانەوە لیی بێزار بو. کاتێك ڕۆشتنە ناو کۆشك، معاویە بەخێرهێنانی ئەحنەفی کرد و ئەوی لای خۆی لەسەر تەختەکە دانیشاند. کەسەکانیتر زمانیان بۆ وەسف کردنی زیاد کردەوە بەڵام ئەحنەف بێدەنگ بو. معاویە وتی: ئەی ئەبو بەحر، هیچ ناڵێیت؟ وتی: ئەگەر بڵێم ناسازگاری لەگەڵ ئەم کەسانە دەکەم. معاویە وتی: هەستن چونکە کوڕی زیادم لەسەر کار لابرد، بەدوای فەرمانداریێکدا بگەڕێن کەپەسەندی دەکەن. هەر کام لەو کەسانە ڕۆشتنە لای ئومەوییەکانی شام و ئەحنەف لەماڵەکەی مایەوە و نەڕۆشتە لای هیچ کەسێك. چەند ڕۆژێك مانەوە و معاویە ئەوانی کۆکردەوە و وتی: هەڵتانبژارد. ئەوان هاودەنگ نەبون و ئەحنەف بێدەنگ. معاویە پرسی: بۆ قسە ناکەیت؟ ئەحنەف وتی: ئەگەر بڕیارە کەسێکیتر لەخزمەکانی خۆت هەڵبژێری، باشترە کەزیاد بێت و ئەگەر لەخەڵکانی دیکە بۆ ئەم کارە دەست نیشان دەکەیت پێویستە بەوردی لێکۆڵینەوە بکەیت. معاویە کوڕی زیادی بۆ فەرمانڕەوایی گەڕاندەوە و پێشنیاری پێکرد ڕێز لەئەحنەف بگرێت و کاری ئەوی بەدورخستنەوەی ئەحنەف بەقێزەون لەقەڵەمدا. کاتێك ئاژاوە سەری هەڵدا، جگە لەئەحنەف کەس لەدەوری نەمایەوە.

## خراپ وتنی یەزید کوڕی موفەرەغی حیمیری لەکوڕی زیاد و بەسەرهاتەکەی

یەزید کوڕی موفەرەغی حیمیری لەگەڵ عوباد کوڕی زیاد لەسیستان بو و عوباد لەوێوە بۆ شەڕی تورکان ڕۆشت و زۆری پێچو. کوڕی موفەرەغ لەم درەنگ کەوتنەی بێزار چونکە سوپاکەی هاوڕێی ئەو لەکەمی تویشو بۆ چوارپێ و مەروماڵاتەکەیان کەوتنە تەنگانەوە. کوڕی موفەرەغ وتی:

الاليت اللحى كانت حشيشا فنعلفها خيول المسلمينا

یانی: خۆزگە ریشەی گیاکان وشك دەبون کەنەسپی موسوڵمانانمان بۆ لەوەڕگەی ئەوان دەبرد.

عوباد پیاوێکی ڕیش درێژ بو. پێیان وت: تەنیا داوای تۆی کردوە و بەس. عوباد بەدوای تۆدا گەڕا و کوڕی موفەرەغ هەڵات و چەندین قەسیدەی بۆ وەسفی خراپەی ئەو هۆنیەوە لەم نمونانەی خوارەوە:

اذا اودى معاوية بن حرب فبشر شعب رحلك بانصداع

فاشهد ان امك لم تباشر ابا سفيان واضعة القناع

ة لكن كان امرا فيه لبس على رجل شديد و ارتياع

یانی: کاتێك کەنەبوسفیان کوڕی حەرب لەناو بچێت، مژدەی بەربلاوی و چەند بەرەکی بەخەڵکەکەی خۆت بدە. شایەتی دەدەم کەنەبوسوفیان دایکتی بێ لەچك (ڕووت و قووت) نەبینیوە. کارێکە ئاڵۆز لەگەڵ ترسێکی زۆر بۆ پیاوێکی بیرمەندی وشیار.

هەروەها:

الا ابلغ معاوية بن حرب مغلغلة من الرجل اليماني

اتغضب ان يقال ابوك عف و ترضى ان يقال ابوك زان

فاشهد ان رحمك من زياد كرحم الفيل من ولد الاتان

یانی: لە لایەن پیاوی یەمانیەوە نامەیەك بەمعاویە کوڕی حەرب بگەیێنە: ئایا تورە دەبیت لەوەی کەبڵێن باوکت داوێن پاك بو و ڕازی دەبیت ئەگەر بڵێن مێ بازا شایەتی دەدەم خزمایەتی تۆ لەگەڵ کوڕی زیاد وەك خزمایەتی فیل لەگەڵ کەرە.

یەزید کوڕی موفەرەغ ڕۆشتە بەسرە و لەم کاتەدا عوبەیداللە کوڕی زیاد لەشام لای معاویە بو. براکەی عوباد کوڕی زیاد نامەی بۆنوسی و لەوتەکانی یەزید ئاگاداری کردەوە. هۆنراوەکانی بێ کەم و کوڕی بۆ خوێندەوە و داوای فەرمانێکی لێکرد تا یەزید بکوژێت. معاویە فەرمانی نەدا و وتی تەنیا بەتەمێ کردنی ئەو بەسەندە بکات.

کاتێك کوڕی موفەرەغ ڕۆشتە بەسرە، پەنای بردە ئەحنەف کوڕی قەیس و گەورەکانیتر بەڵام کەس پەنای نەدا. پەنای بردە بەر مونزە کوڕی جارود کەئەوی

پەنادا و بردیە ماڵەکەی خۆی. کچی ئەم مونزەرە ژنی عوبەیداللە بو. کاتێك کوڕی زیاد ڕۆشتە بەسرە، لەشوێنەکەی کوڕی موفەرەغ ئاگاداریان کردەوە. مونزەر بۆ بەخێرهێنان ڕۆشتە لای عوبەیدالیە. عوبەیداللە پاسەوانەکانی نارد کەیەزید کوڕی موفەرەغیان هێنایەدەر و کاتێك مونزەر لای عوبەیداللە بو، بردیانە لای. مونزەر وتی: ئەی فەرماندار، من پەنام پێداوە! عوبەیداللە وتی: ئەی مونزەر، خراپەی من دەڵێت و تۆ و باوکت وەسف دەکات و تۆ لەزیانی من پەنای دەدەیت! دواتر فەرمانیدا و دەرمانێکیان دەرخوارددا و سوار کەرێکیان کرد و لەبازار و کۆڵانەکاندا سوڕاندیان. خۆی پیس دەکرد و لەوەسفی خراپەی مونزەردا دەیوت:

| | |
|---|---|
| ترکت قریشا ان اجاور فیهم | و جاورت عبد القیس اهل المشقر |
| اناس اجارونا فکان جوارهم | اعاصیر من فسو العراق المبذر |
| فاصبح جاری من جنیمة نائما | و لا یمنع الجیران غیر المشمر |

یانی: وازم لەقورەیشیەکان هێنا و پەنام بۆ ئەوان نەبرد و پەنام بردە بەربنەماڵەی عەبدقەیس و پەناکەیان لەگێژەڵوکەی تسی بۆندار دەچو. پەنا بردنی من بۆ جەزیمە لەکاتی خەوی ئەودا بو. بەڵێ، جگە لەو پیاوەی بۆ شەڕ خۆی ئامادە کردوە، کەس ناتوانێت پەنای کەسێکیتر بدات.

ئەو بۆ عوبەیداللەی وت:

| | |
|---|---|
| یغسا الماء ما صنعت و قولی | راسخ منك فی العظام البوالی |

یانی: ئاو، ئەو کارەی تۆ لەگەڵ منت کرد، دەیشواتەوە، بەڵام وتاری من سەبارەت بەتۆ، کاریگەری لەسەر ئێسقانە رزاوەکانیش دادەنێت.

عوبەیداللە ئەوی بۆ سیستان بۆ لای براکەی رەوانە کرد. خەڵکانی یەمەنی نیشتەجێی شام سەبارەت بەو قسەیان لەگەڵ معاویە کرد. ئەو کەسی بۆ لای عوباد رەوانە کرد و یەزید کوڕی موفەرەغی ئازاد کرد. یەزید بەرەو دەرباری معاویە بەرێکەوت و لەرێگادا وتی:

| | |
|---|---|
| عدس ما لعباد علیك امارة | امنت و هذا تحملین طلیق |
| لعمری لقد نجاك من هوة الردی | امام و حبل للانام وثیق |
| ساشکر ما اولیت من حسن نعمة | و مثلی بشکر المنعمین حقیق |

یانی: هێی، بەتوندی غار بدە چونکە عوباد دەستی بەتۆ ناگات. ئاسودە بویت و ئەمەی کەسوار لەپشتی خۆت دەیبەیت، ئازادە. سوێند بەخوا ڕێبەرێکی بیرمەند و کاروبارێکی بەهێز بۆ خەڵك، تۆ لەچاڵی لەناوچون رزگار دەکات. سوێند بەگیانی خۆم سوپاسی بەخشینەکەی تۆ دەکەم و ڕێزی لێدەگرم چونکە شیاوە بۆ کەسێکی وەك ڕێز لەبەخشینەکانی کەسیانیتر بگرێت.

کاتێك ڕۆشتە لای معاویە، گریا و وتی: بێ هیچ گوناحێك، سزاپایەکیان دام کە لەگەڵ هیچ موسوڵمانێك نایکەن. معاویە پێی وت: مەگەر تۆ نەبویت کەوتت: پەیامێك لەمن بۆ معاویە کوڕی حەرب ببەن (تا کۆتایی هۆنراوەکە). وتی: نتە، سوێند بەو خوایەی ئەرکی سەرشانی سەروەری باوەڕدارانی گران کرد، من ئەم هۆنراوەم نەوتوە بەڵکو عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم برای مەروان وتویەتی و منی کردە بیانوێك بۆ خراپە وتن لەزیاد. وتی: مەگەر تۆ نەتوت: شایەتی دەدەم ئەبوسوفیان دایکتی روت و قوت نەکردۆتەوە؟ و هۆنراوەی زۆر کە بۆ خراپ وتنی زیاد هۆنیوتەتەوە! برۆ لەتۆ خۆش بوین و لەهەر سەرزەمینێك کەپێت خۆشە ژیان ببەسەر. ئەو ڕۆشتە موسڵ و ژنی هێنا و کاتێك ویستی شەوی یەکەم بڕواتە ئامێزی هاوسەرەکەی، ڕۆشتە راو و پیاوێکی لەسەر کەرێك بینی. وتی: لەکوێوە دێیت؟ وتی: لەئەهواز. پرسی: ئاوی موسروقان چی بەسەرهات؟ وتی: وەك خۆیەتی. ئەو بەرەو بەسرە بەرێکەوت و ڕۆشتە لای کوڕی زیاد و کوڕی زیاد ئەمانی پێ بەخشی.

معاویە بەعەبدولرەحمان کوڕی حەکەم تورە بو. چەندین کەس داوای بەخشینی ئەویان کرد. وتی: تا کوڕی زیاد لێی خۆش نەبێت، لێی خۆش نابم. عەبدولرەحمان لەبەسرە ڕۆشتە لای کوڕی زیاد و وتی:

| | |
|---|---|
| لانت زیادة فی آل حرب | احب الی من احدی بناتی |
| اراك اخا و عما و ابن عم | فلا ادری بغیب ما ترانی |

یانی: تۆ کەسێکی تازەی لەناو بنەماڵەی حەرب و لەیەك یەکی کچەکانم لای من ڕێزدارتریت. تۆ وەك برا و مام و کوڕە مام دەبینم بەلام نازانم تۆ من بەچی خۆت دەزانی.

وتی: وەك وتاردەرێکی قێزەون و هەڵیت وپڵیت بێژ. بەلام لێی خۆش بو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەمساڵەدا عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەبوسوفیان ئاپینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا.

کارگوزاران لەم ساڵەدا ئەم کەسانە بون: نوعمان کوڕی بەشیر لەکوفە، عوبەیدالله کوڕی زیاد لەبەسرە، وەلید کوڕی عوتبە لەمەدینە، عەبدولرەحمان کوڕی زیاد لەخوراسان، عوباد کوڕی زیاد لەسیستان و شەریك کوڕی ئەعوەر لەکرمان.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادەی ئەنسار لەمەدینە کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٠/ ٦٨٠ زایینی مرد. ئەو لەهەمو شەڕەکانی پێغەمبەر بەشداری کرد. سەعید کوڕی عاس کەلەرۆژی کۆچ کردنی پێغەمبەر لەدایك بو و باوکی لەسەر ناباوەڕی لەشەڕی بەدر کوژرا. مورە کوڕی کەعب بەهری سولەمی کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو. ئەبومەحزورە جومەحی چاووشی پێغەمبەری خوا لەمەککە، ئەو دوای مردنی پێغەمبەر چاووشی بۆ هیچ کەسێك نەکرد و هەروەها منداڵەکانیشی. دەڵێن: لەساڵی ٦٩/ ٦٨٨ زایینی مرد. عەبدالله کوڕی عامر کوڕی کورەیز لەمەککە، ئەویان لەعەرەفات بەخاك سپارد. ئەبوهورەیرە لەبەر ئەوەی یەکێك بو لەشوێنکەوتوانی عوسمان، منداڵەکانی جەستەی ئەویان بەخاك سپارد.

هەروەها لەم ساڵەدا موسوڵمانان بەسەرکردایەتی عومەیر کوڕی حوبابی سولەمی بەرەو شەڕ لەقەڵای کەمخ بەرێکەوتن. عومەیر رۆشتە سەر دیواری قەڵاکە و بەتەنیایی شەڕی کرد تا پاشەکشێی بەرۆمیەکان کرد و خوا هاوکاری عومەیری کرد و دەستیان بەسەر ئەو قەڵایەدا گرت. ئەو شانازی بەم کارەی خۆی دەکرد و خەڵکانیش.

## ڕوداوەکانی ساڵی شەستی کۆچی( ٦٨٠/٦٨١ زایینی )

بەوتەی دەستەیەك لەم ساڵەدا مالك کوڕی عەبدالله لەقوڵاییەکانی سوریا شەڕی کرد و جونادە ڕۆشتە ناو دورگەی ڕودس و شارەکەی کردە وێرانە. هەروەها لەم ساڵەدا معاویە کوڕی ئەبوسوفیان مرد. ئەو پێش مەرگ، لەدەستەی نوێنەرایەتی بەسرە بۆ کوڕەکەی بەیعەتی وەرگرت.

## مردنی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان

معاویە پێش مەرگی وتارێکدا و وتی: من لەکەشتەیەك دەچم کەکاتی نوقم بونی گەشتبێت. فەرمانڕەوایی من لەسەر ئێوە ئەوەندە درێژەی کێشا کە ئێوە لەمن بێزار بون و من لەئێوە. من ئارەزویی جیابونەوەم لەئێوە کرد و ئێوە لەمن. دوای من هیچ کەسێك فەرمانڕەوایی ئێوە ناکات مەگەر ئەوەی من لەو باشتر بوبێتم بەهەمان شێوە کەپێشینانی من لەمن باشتر بون. وتویانە: هەرکەس ئارەزویی دیداری خوا بکات، خوا دیدارەکەی ئەوی خۆش دەوێت. ئەی خوایە، من خوازیاری دیداری تۆم. کەواتە دیداری منت خۆش بوێت و مەرگ لەسەر من پیرۆز بکە.
ئەوەندەی نەخایاند نەخۆشیەکەی دەستی پێکرد. کاتێك نەخۆشیەکەی دەستی پێکرد، لەزیانەکەی مرد، کوڕەکەی یەزید بانگ کرد و پێی وت: کوڕم، من باربەستن و کۆچ کردن و ڕاکردنم لەسەر شانی تۆ هەڵگرت و کاروبارەکانم بۆ تۆ ئارام و ئاسان کرد و دوژمنانم کردە فەرمانبەری تۆ و ملکەچیم بەعەرەبەکان کرد لەبەرابەر تۆ و ئەوەندە سامانم بۆ تۆ کۆکردۆتەوە پێشتر کەس ئەو کارەی نەکردوە. بەچاوی خۆشەویستیەوە سەیری خەڵکانی حیجاز بکە چونکە ئەوان بناغەی پێگە و پایەی تۆن. هەر کەس لەوان هاتە لای تۆ، ڕێزی لێ بگرە و هەرکەس نەهات، بەدوایدا بگەڕێ و ڕێزی لێ بگرە. بەوردی ئاگات لەکاروباری عێراقیەکان بێت و ئەگەر هەمو ڕۆژێك داوات لێ بکەن فەرمانڕەواکەیان لەسەر کار لاببەیت، ئەو کارە بکە، چونکە لەسەر کار لابردنی فەرمانڕەوایەك باشترە لەوەی ڕوبەڕوی سەد هەزار شمشێری دەرکێشراو ببیتەوە. سەیری خەڵکانی شام بکە و بزانە کەدبێت پشتیوان و پەناگەی تۆبن. ئەگەر دوژمن

کارێك بکات و گومانی لای تۆ دروست کرد، بەهاوکاری خەڵکانی شام سەرکوتی بکە و کاتێك ئەم کارەت کرد، ئەوان بۆ شام بگەڕێنەوە چونکە ئەگەر ئەوان بۆ ماوەیەکی درێژ لەشوێنێکدا بمێننەوە، خو و عادەتەکانیان خراپ دەبێت. من ترسی ئەوەم نیە کەس لەسەر فەرمانڕەوایی شەڕی تۆ بکات مەگەر چوار کەس لەقورەیشیەکان: حسین کوڕی عەلی، عەبدالله کوڕی عومەر، عەبدالله کوڕی زوبەیر و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر.

بەلاّم کوڕی عومەر، پەرستینی خوا ئەوی لەپێ خستوە و ئەگەر جگە لەخۆی کەس نەمێنێتەوە، بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکات. بەلاّم حسین کوڕی عەلی، پیاوێکی ناثارام و ئازادەیە و عێراقیەکان دەستی لێ هەڵناگرن تا ئەو لەشارەکەی بکێشنەدەر. ئەگەر بزوتنەوەیەك دەست پێ بکات و تۆ بەسەر ئەودا سەرکەویت، لێی خۆش ببە چونکە رێز لەپەیوەندی خزمایەتی دەگرێت هاورێ لەگەڵ مافی گەورەیی نزیکی لەپێغەمبەر. بەلاّم کوڕی ئەبوبەکر، ئەگەر ببینێت هاورێکانی کارێك دەکەن، ئەویش دەست پێدەکات بەلاّم لەراستیدا جگە لەخەوتن لەباوەشی گەرم و نەرمی ژنان و گاڵتە و گەپ لەگەڵ ئەم و ئەو، هیچ هونەرێکی دیکەی نیە. بەلاّم ئەو کەسەی وەك شێرێکی خەوتوو لەسەر رێگەی تۆ لەسەر زەوی دەخەوێت و وەك رێوی فریو لەگەڵ تۆ بەکار دەبات و زۆرانت لەگەڵ دەگرێت و ئەگەر دەرفەتی دەست کەوێت، پەلامارت دەدات، کوڕەکەی زوبەیرە. ئەگەر شەڕی لەگەڵ تۆ دەست پێکرد و بەسەریدا سەرکەوتیت، لەت لەتی بکە. تا ئەو شوێنەی دەتوانی رێز لەخوێنی خەڵکەکەت بگرە.

لەم گێرانەوەیەدا بەمشێوەیە کەناوی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر ئاماژەی پێدراوە، بەلاّم راست نیە چونکە عەبدولرەحمان پێش معاویە کۆچی دوایی کردبو. دەستەیەك دەڵێن: لەکاتی نزیك بونەوەی مەرگی معاویە، یەزید لای ئەو نەبو و معاویەزوحاك کوڕی قەیس و موسلیم کوڕی عوقبەی موری بانگ کرد و فەرمانی پێدان ئەم پەیامە بەیەزید بگەیێنن. گێرانەوەی راست ئەمەیە.

ئەو لەشاری دیمەشق، لەسەرەتایی رەجەب یا نیوەی یا هەشت رۆژ ماوە بۆ کۆتایی رەجەب/ ٧ یا ٢١ یا ٢٨ ئاوریلی ٦٨٠ زایینی کۆچی دوایی کرد. پاشایەتی ئەو نۆزدە ساڵ و سێ مانگ و بیست و حەوت رۆژ درێژەی کێشا و ئەمە لەو کاتەوەیە کەحەسەن

کوڕی عەلی بەیعەتی لەگەڵ کرد و فەرمانڕەوایەتیەکەی بەهێز بو. دەستەیەك دەڵێن: فەرمانڕەوایەتی ئەو نۆزدە ساڵ وسێ مانگ یا ١٩ ساڵ و ٣ مانگ و چەند ڕۆژێك کەمتر بو. ساڵەکانی تەمەنی ٧٥ یا ٧٣ یا ٧٨ یا ٨٥ ساڵ بو.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك نەخۆشیەکەی پەرەی سەند و لەرز دایگرت، بەکەسەکانی خۆی وت: چاوەکانم پڕکەن لەسورمە و سەرم بەرۆن چەور بکەن. ئەو کارەیان کرد و روخساریان بەرۆن درەخشان کرد و دواتر پاڵپشتێکیان بۆ ئامادە کرد و لەوێدا دایاننیشاند. فەرمانی بەخەڵکدا کەڕۆشتنەی لای و بەپێ وە سلاّویان لێکرد و کەس دانەنیشت. کاتێك لای ئەو ڕۆشتنەدەر، وتیان، تەندروستە. کاتێك دەڕۆشتنەدەر، معاویە بەخۆی وت:

بتجلدی للشامتین اریهم انی لریب الدهر لا اتضعضع

و اذا المنیة انشبت اظفارها الفیت کل تمیمة لا تنفع

یانی: بەچالاکی خۆم، بەمشێوە نیشانی سەرکۆنەکەرانی دەدەم کە لەبەرابەر سەختیەکانی رۆژگار سەر دانانەوێنم. بەلاّم کاتێك مەرگ چنگەکانی خۆی بلاّو بکاتەوە، هەر بازوبەندێك بەبێ سوود دەزانم.

ئەو ئازاری سینەی بو و خڵتە لەقوڕگیەوە دەهاتەدەر. لەهەمان رۆژدا مرد. کاتێك مەرگی گەیشت، وتی: پێغەمبەری خوا کراسێکی بەمن بەخشی کەهەڵم گرتوە. رۆژێکیش نینۆکی دەکرد کەنینۆکەکانیشم هەڵگرتوە. کاتێك مردم، ئەو کراسەم لەبەر بکەن و نینۆکەکان بکوتن و بیکەنە چاو و دەمی من لەوانەیە خوا لەپیرۆزی ئەوانە من ببەخشێت. دواتر هۆنراوەکەی ئەشهەب کوڕی رەمیلەی ئەهشەلی خوێندەوە:

اذ امت مات الجود و انقطع الندی من الناس الا من قلیل مصرد

وردت اکف السائلین و امسکوا من الدین و الدنیا بخلف مجدد

یانی: کاتێك بمرم، بەخشندەیی دەمرێت و دڵ و دەستەکان دوبارە دەبڕدرێنەوە. ئەمانە لەخەڵك وەردەگیرێنەوە جگە لەکەمێك (نەك بەئەندازەی پێویست) نامێنێتەوە. دەستی داواکاران بەخاڵی دەهێڵنەوە و جگە لەمزدەی پڕوپوچ هیچیان پێ نابەخشن.

یەکێك لەکچەکانی وتی: هەرگیز، ئەی سەروەری باوەڕداران، بەڵکو خوا ئەم لاوازیە

لەتۆ دوردەخاتەوە. لێرەوە بو کەهۆنراوەی ئەو شاعیرە (هەزلیەی) هێنایە سەرزمان (چنگاڵی مەرگ ئەگەر قورگی کەسێك بگوشێت، ئەفسونی مۆغەکان پوچ دەکاتەوە). بەکەسەکانی خۆی وت: لەخوا بترسن چونکە ئەوەی لەخوا نەترسێت، کەس پارێزگاری لێ ناکات. دواتر چاوی بەست. پێشنیاری کرد نیوەی سامانەکەی بۆ گەنجینە بگەرێننەوە وەك بڵێی دەیویست نیوەکەی تری نۆش بکات چونکە عومەر کوڕی خەتابیش ئەم کارەی کرد کەسامانی کارگوزارەکانی نیو بەنیو دابەش کرد: نیوەی بەگەنجینە دەسپارد و نیوەی دەهێشتەوە بۆ خاوەنەکەی.

معاویە لەکاتی مەرگدا ئەم هۆنراوانەی دەخوێندەوە:

ان تناقش یکن نقاشك یار ب عذابا لا طوق لی بالعذاب

او تجاوز فانت رب صفوح عن مسیء ذنوبة کالتراب

یانی: ئەی خوایە، ئەگەر لێکۆڵینەوە و لیپێچینەوە دەست پێبکەیت و کار بەئەشکەنجە کۆتایی بێت، من توانایی بەرگە گرتنم نیە. ئەگەر لێم خۆش بیت، تۆ خواوەندێکی بەخشندەیت و گوناحەکانی بەندەیەکی گوناحاکار دەبەخشیت کەزیاتر لەخۆڵی سەرزەویە.

کاتێك نەخۆشیەکەی روی لەقورس بون کرد، کچەکەی رەملە سەری خستە سەر داوێنی و دەستی بەسەریدا دەهێنا. معاویە وتی: دەست بەسەر سەری پیاوێکی کارزان و خاوەن ئەزمونەدا دەهێنیت. لەمناڵیەوە تا پیری سامانی بۆ ئێوە کۆکردەوە. خۆزگە نەدەکەوتە ئاگری جەهەننەمەوە.

دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

لقد سعیت لکم من سعی ذي نصب و قد کفیتکم التطواف والرحلا

یانی: بۆ ئێوە هەوڵی زۆرمدا و رەنجی زۆرم برد و رێگەی کۆچ کردن و گەڕانم لەبەردەم ئێوە هەلگرت.

ئاگاداریان کردەوە کەدەستەیەك لەمەرگی ئەو شادمانی دەردەبڕن. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

فهل من خالد ما ان هلکنا و هل بالموت یا للناس عار

یانی: ئەگەر ئێمە بمرین، کەسانی تر هیچ کات نامرن؟ ئەی خەڵکینە، ئایا مەرگ

ئازار دەکێشێت. دواتر سواربوین و غارماندا و هەوسارەکانمان بەجێهێشت. ڕێگەکراوەکانی نێوان هەردو کێوەکەمان بڕی و لەپەلە کردن کەمتەرخەمیمان نەکرد. زەوی بەسەر سەرمانەوە دەسورا یا دەیویست ئێمە بسورێنێتەوە. وەك بڵێی ستونێکی گەورە لەستونەکانی داڕمابو. ئەو کەسەی بەردەوام گیانی بەرەو گەورەیی و ڕێزداری رادەکێشرا، ئەوەندە نەما بو ڕشتەکانی ئەو گیانە بقرتێت و هەڵوەشێت. کاتێك گەشتینە دەروازەی کۆشك و سەرەوەمان بینی و دەنگی گریانی ڕەملەمان بیست، دڵمان ترسی لێ نیشت و لەت لەت بو. دواتر، دوای ماوەیەك بێ ئارامی، دڵ ئارامی گرت و زانیم لەتاو تا و ئازار، بەئارامی راکشاوە. کوڕی هند لەناوچو و گەورەیی و بەخشندەیی بەدوایی ئەو لەناوچون. ئەم دوانە پێکەوە بون و لەبەر ئەمە پێکەوە سەریان خستە سەر سەرین و مردن. پیاوێکی روخسار سپی و روخۆش بو کەهەور لەروخساری ئەودا بەدوای باراندا دەگەڕا. ئەگەر لەگەڵ هەمو خەڵکان لەسەر پێگە و نەژاد شەری دەکرد، لەپێشتر لەهەموان بو.

یەزید کاتێك گەیشت کەئەویان بەخاك سپاردبو. لەبەر ئەمە نوێژی لەسەر خاکەکەی خوێند.

## نەژاد و ناو و نیشان و ژنان و منداڵەکانی معاویە

نەژادی ئەو بەمشێوەیە: معاویە کوڕی ئەبو سوفیان (صخر) کوڕی حەرب کوڕی ئومەییە کوڕی عەبد شەمس کوڕی عەبد مەناف کوڕی قوصەی کوڕی کەلاب. نازناوەکەی باوکی عەبدولرەحمان بو.

ژنان و منداڵەکانی: یەکیان میسون کچی بەجدەل کوڕی ئەنیف دایکی یەزید: دەڵێن: ئەم ژنە کچێکی هێنایە دنیا کەبەناوی (رب المشارق) خۆری خاوەران ناویان دەبرد و لەمناڵیدا مرد. یەکێکیتر فاختە کچی قەرەزە کوڕی عەبدعەمرۆ کوڕی نەوفل کوڕی عەبد مەناف بو کەعەبدولرەحمان و عەبداللە بۆ هێنایە دنیا. عەبداللە پیاوێکی گێژ و نەزان بو. رۆژێك لای ئاشەوانێکەوە تێپەڕی و بینی ئێسترێك ئاشەکەی بۆ دەسورێنێت کەچەندین زەنگۆڵەی لەملدایە. پرسی: ئەم زەنگۆڵانە بەکەڵکی چی دێن. ئاشەوان وتی: بۆ ئەوەیە بزانم ئێسترەکە دەروات چونکە ئەگەر بێستێت دەنگی

**هۆکاری شەرم و ریسواییە؟**

نەخۆشیەکەی سات بەسات قورستر دەبو و هەندێ کات شتەکانی تێکەڵ دەکرد. جارێك وتی: لێرەوە تا غوتە چەندە رێگایە؟ کچەکەی هاواری کرد: ئەی هاوار چەندە نازارێکی گیانستێنە! معاویە هاتەهۆش و وتی: ئەگەر رەم بکەیت، بەراستی جێگەی خۆیەتی چونکە پێشهاتێکی رەم پێکەری وەك مەرگت بینیوە.

کاتێك مرد، زوحاك کوڕی قەیس هاتەدەر و لەسەر تەختی وتاردان دانیشت و جل وبەرگی مەرگی معاویەی بەدەستەوە گرت. سوپاسی خوای کرد و معاویەی وەسف کرد و دواتر وتی: معاویە، پیاوی کارزانی عەرەبەکان و سنوری عەرەبەکان و باوەگەوریی عەرەبەکان بو. خوا بەهێزی ئەو ئاژاوەکانی دامرکاندەوە و ئەوی کردە پاشای بەندەکانی و لەسەر دەستی ئەو وڵاتەکانی گرت. ئێستا ئاگاداربن کەئەو مردوە و ئەمە جل و بەرگی مەرگی ئەوە کەلەدەستی مندایە. ئێمە بەم جلانە کفنی دەکەین و بەخاکی دەسپێرین و لەگەڵ کار و کردەوەکانی لەم جیهانە بەجێی دێڵین. ئەوسا تا رۆژی کۆتایی ئاژاوە دەبێت. ئەگەر کەسێك دەیەوێت بیبینێت، لای کەسەکانی خۆیەتی. زوحاك نوێژی لەسەر خوێند.

کاتێك نەخۆشیەکەی قورس بو، نامەیان بۆ کوڕەکەی نوسی کە لە(حووارین) بو و داوایان لێکرد زوتر بگەرێتەوە. یەزید ئەم هۆنراوەی نوسی:

| | |
|---|---|
| جاء البريد بقرطاس يخب به | فاوجس القلب من قرطاسه فزعا |
| قلنا: لك الويل ماذا فى كتابكم؟ | قال: الخليفة امسى مثبتا وجعا |
| ثم انبعثنا الى خوض مزممة | نرمى الفجاج بها لا ناتلى سرعا |
| من لم تزل نفسه توفيا على شرف | توشك مقاليد تلك النفس ان تقعا |
| لما انتهينا و باب الدار منصفق | و صوت رملة ريع القلب فانصدعا |
| ثم ارعوى القلب شيئا بعد طيرته | و النفس تعلم ان قد اثبتت جزعا |
| اودى ان هند و اودى المجد تتبعه | كانا جميعا فماتا قاطنين معا |

یانی: پەیك ئارام ئارام لەهەوراز و نشیوەکان بەرەو لای ئێمە دەهات و کاغەزێکی لەگەڵ خۆی هێنا. ئێستاکە دڵی لەبینین کاغەزەکە کەوتە ترسەوە. وتمان: هاوار لەتۆ، لەنامەکەی تۆدا چیان نوسیوە؟ وتی: جێگری خوا لەسەر زەوی، لەجێگەدا کەوتوە و

زەنگۆڵەکان ئارام دەبێتەوە. عەبدولرەحمان وتی: بیرت لەوە کردۆتەوە ئەگەر بێستێت و سەری تەکان بدات، دەبێ چی بکەیت؟ ئاشەوان وتی: ئێسترەکەی من وەك شازادە ئاوزی نیە. عەبدولرەحمان لەمناڵیدا مرد. یەکێتریان نائیلە کلابی کچی عومارە بو. معاویە ئەوی کردە هاوسەری خۆی و بەمیسونی وت: سەیری جەستە و ران و مەمکی ئەو بکە بزانە نەرم و رەقە یا نە. میسون وتی: جوانە بەڵام لەژێر ناوکیدا خاڵێك هەیە و ئەمە بەمانای ئەوەیە کەهاوسەرەکەی سەر دەبڕن و دەیخەنە سەر سینەی. معاویە وازی لێهێنا و حەبیب کوڕی موسلیمەی فەهری ئەوی کردە هاوسەری خۆی. دوای مردنی ئەو نەعمان کوڕی بەشیری بوبەهاوسەری. ئەویان سەر بڕی و سەریان خستە سەر سینەی ئەو ژنە. یەکێکیتر لەهاوسەرەکانی معاویە، کەتوە خوشکی فاختە کچی قورەزە بو. کاتێك معاویە ڕۆشتە شەڕی قوبرس، ئەوی لەگەڵ خۆیدا برد.

## کاروکردەوەکانی معاویە دادیاران و دەبیرەکانی ئەو

کاتێك بۆ خەلافەت پەیمانیان لەگەڵ معاویە بەست، ئەو قەیس کوڕی حەمزەی هەمەدانی کردە سەرپەرستی پاسەوانەکانی خۆی. دواتر ئەوی لەسەر کار لابرد و زەمل کوڕی عەمرۆ عوزری هێنایە سەرکار. سەکسەکی دەڵێت: رازدار و دەبیرەکەی سێرجونی رۆمی بو و سەرکردەی پاسەوانەکانی پیاوێك لە(موالی) کەپێیان دەوت موختار. دەستەیەك دەڵێن: ئەبو موخارق مالك موالی حیمەیر بو. معاویە یەکەم کەس بو بۆ پارێزگاری کردن لەگیانی خۆی پاسەوانی بەکار برد. سەرپەرستی درگاوانەکانی سەعد کۆیلەکەی خۆی بو. کاروبارەی دادوەری ئەو لەلایەن فوزالە کوڕی عوبەیدی ئەنساری هەڵدەسوڕا. ئەو مرد و معاویە باوکی ئیدریسی خولانی کردە سەرپەرستی کاروباری دادوەری. سەرپەرستی دەبیرخانەی مۆرداری ئەو عەبداللە کوڕی میحصەنی حیمەیری بو. معاویە یەکەم کەس بو دەبیرخانەی مۆرداری بۆ خۆی دروست کرد. هۆکاری بناغەدانانی ئەم دەبیرخانەیە ئەوە بو کەمعاویە فەرمانی بە زیاد دا سەد هەزار درەم بەعەمرۆ کوڕی زوبەیر بدات. عەمرۆ نامەکەی کردەوە (چونکە لەدەستی خۆیدا بو) و سەد هەزارەکەی کردە دوسەد هەزار. کاتێك زیاد ئاماری ساڵانەی خۆی بەمعاویە راگەیاند، معاویە بەناراستی زانی و داوای سەد هەزار درەمەکەی لەعەمرۆ کرد و ئەوی لەسەر ئەم کارەی خستە زیندانەوە. براکەی عەبداللە کوڕی زوبەیر پارەکەی بۆ دایەوە. لەم کاتەدابو معاویە بناغەی دەبیرخانەی مۆرداری دانا و فەرمانیدا نامەکان مۆر بکەن چونکە پێشتر ئەو کارەیان نەدەکرد.

عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: ئێوە ئاماژە بەسزار خوسرەو دەدەن لەکاتێکدا معاویە کوڕی ئەبوسوفیان لای ئێوەیە.

دەستەیەك دەڵێن: عەمرۆ کوڕی عاص لەگەڵ دەستەیەك لەمیسریەکان رۆشتە لای معاویە. لەرێگادا بەهاورێکانی خۆی وت: وەك خەلیفە سڵاو لەمعاویە مەکەن چونکە ئەم کارە شکۆ و گەورەیی ئێوە لای ئەو زیاد دەکات و لەبەر ئەمە باشترە ئەو بە کەم بزانن. کاتێك گەیشتن: معاویە بەدرگاوانەکانی وت: گومانم وایە کوڕی نابیغە گەورەیی منی لای هاورێکانی خۆی کەم کردۆتەوە. ئاگادار بن کاتێك ئەم خەڵکانە گەیشتن تا

نەتوانن بەچاوی سوك سەیریان بكەن و بەتوندی هەڵس و كەوتیان لەگەڵ بكەن.
یەكەم كەس كەرۆشتە لای پیاوێك بو بەناوی كوڕی خەیات. ئەو وتی: سڵاو لەتۆ ئەی پێغەمبەری خوا! كەسانیتر بەدوای ئەودا هاتن و ئەو كارەیان دوبارە كردەوە. كاتێك رۆشتنەدەر، عەمرۆعاص وتی: خوا نفرینتان بكات، نەمهێشت وەك خەلیفە سڵاوی بۆ بنێرن بەڵام ئێوە وەك پێغەمبەر درووودتان بۆ نارد!

دەستەیەك دەڵێن: عوبەیدالله كوڕی ئەبی بەكرە هاوڕێ لەگەڵ كوڕەكەی رۆشتە لای معاویە. كوڕەكەی زۆری دەخوارد و معاویە بەردەوام سەیری دەكرد. عوبەیدالله هەستی بەمە كرد و ویستی بەچاو كوڕەكەی حاڵی بكات تا كەمتر بخوات. كوڕەكەی تا كۆتایی سەری لەسەر سفرەكە هەڵنەگرت. دواتر معاویە لێی پرسی: كوڕە زۆر خۆرەكەت چی بەسەرهات؟ وتی: توشی سك ئێشە بو. معاویە وتی: زانیم ئەو هەمو خواردنە توشی ئازاری دەكات.

جویریە كوڕی ئەسما دەڵێت: ئەبوموسا ئەشعەری بەكڵاوێكی رەش لەسەر، رۆشتە لای معاویە و وتی: سڵاو لەتۆ ئەی گەورەی بەرێز! معاویە وتی: سڵاو لەتۆ. كاتێك رۆشت، معاویە وتی: پیرەپیاو دەیویست وەك فەرمانداری شوێنێك دەست نیشانی بكەم، سوێند بەخوا ئەو كارە ناكەم.

رۆژێك عەمرۆعاص پێی وت: مەگەر من باشترین چاكەخوازی خەڵكان بۆ تۆنیم؟ معاویە وتی: لەم رێگاوە بو بەهەمو شتێك گەیشتی.

هەروەها جویریە كوڕی ئەسما دەڵێت: بوسر كوڕی ئەبی ئەرتا لای معاویە بو و دەستی بەقسەی هەڵیت و پڵیت لەبارەی عەلی كوڕی ئەبی تالب كرد و زەید كوڕی عومەر كوڕی خەتاب كەدایكی دایكی كولسوم كچی عەلی كوڕی ئەبی تالب بو، لەوێ بو. زەید داردەستێكی هەڵگرت و كێشایی بەسەری بوسردا و سەری شكاند. معاویە بەزەیدی وت: بەداردەست لەپیری قورەیش و سەرورەی خەڵكانی شامتدا و سەریت شكاند! دواتر روی كردە بوسر و وتی: قسەی ناشیرینیت بەعەلی وت كەباوەگەوری ئەم گەنجەیە؟ ئەو كوڕی فاروقە و تۆ لەبەرچاوی هەموان جوێنت بەباوەگەورێیدا!! ئایا گومان دەكەیت بەم كارە رازی دەبێت؟ دواتر هەردوكیانی رازی كرد.

معاویە وتی: من خۆم بەگەورەتر لەوە دەزانم كەگوناحێك گەورەتر لەبەخشینی من

لەئارادا بێت و نەزانی کەسێك زیاتر لەفەرمزانی من و شوێنی شەرمێك کەبەداپۆشینی خۆم ئاشکرای ناکەم و خراپەکاریەکی قێزەون کەگەورەتر لەچاکەکاریم دەرکەوێت.

هەروەها معاویە بەعەبدولرەحمان کوڕی حەکەمی وت: براکەم، تۆ زمانت بۆ شێعر هۆنینەوە کردۆتەوە، ئاگادار بە وەسفی ژنان و کچانی خەڵك بکەیت چونکە دەتوانیت ژنێکی گەورە و داوێن پاك برەنجێنیت، لەخراپە وتن خۆت بەدور بگرە، ئاگادار بە ڕێزدارێك نەرەنجێنیت و دەست بەرداری پیاهەڵدان ببە چونکە کاڵای بێ ئابڕوەکان و بێ شەرمەکانە. ئاماژە بەهۆکارەکانی شانازی کردنی خەڵکەکەت بدە و هەرچەند دەتوانی، وتاری گەورەکان لەناو شێعرەکانی خۆتدا بگونجێنە چونکە بەم کارە خۆت دەرازێنیتەوە و ڕێنوێنی کەسانیتر و ئامۆژگاریان دەکەیت.

عەبداللە کوڕی صالّح دەڵێت: لەمعاویەیان پرسی: لەخەڵکان، کامیانت زیاتر لەهەموان خۆش دەوێت؟ وتی: ئەوانەی هەوڵدەدەن زیاتر لەخەڵك نزیك ببنەوە و ببنە خۆشەویست و ڕێزداری خەڵکان.

دوبارە معاویە وتی: ئاوز و خۆراگری و زانست باشترینی خواستەکانن کەبە بەندەکان بەخشراون. کاتێك بیری خەڵکی دەخەنەوە، بیری دەکەوێتەوە و کاتێك بەوی ببەخشن، سوپاس دەکات و کاتێك گیرۆدەی تاقی کردنەوە بێت، خۆراگری دەنوێنێت و کاتێك توڕە ببێت، تورەیی خۆی دەخواتەوە و کاتێك سەرکەوێت، خۆش دەبێت و کاتێك خراپە بکات، داوای لێخۆشبون دەکات و ئەگەر مژدە و مزگێنی بەکەسێك بدات، بەئەنجامی دەگەیێنێت.

عەبداللە کوڕی عومەر وتی: پیاوێك بەتوندی لەگەڵ معاویە قسەی کرد و سنوری خۆی بەزاند. پێیان وت: ئایا لەبەرابەر ئەم پیاوە هیچ ناڵێیت؟ وتی: ئەگەر خەڵکان دەست بەرداری ئێمە و پاشایەتیەکەمان ببن، ئێمەیش دەست بەرداری ئەوان و زمانیان دەبین.

محەممەد کوڕی عامر وتی: معاویە سەرکۆنەی عەبداللە کوڕی جەعفەری کرد بۆ گۆرانی وتن و لۆتیەتی. ڕۆژێك عەبداللە هاوڕێ لەگەڵ بودەیحی ئاوازخوێن ڕۆشتە لای معاویە و ئەو قاچی خستبوە سەرقاچی و دانیشتبو. عەبداللە بەبودەیحی وت: ئەی بودەیح، خوێندن دەست پێبکە. بودەیح دەستی بەخوێندن کرد. عەبداللە وتی: ئەی

سەروەری باوەڕداران ئارام بە! معاویە وتی: پیاوی ڕێزدار گەمەکەرە.

عەبداللە کوڕی عەباس وتی: بۆ پاشایەتی کەسم ڕوخۆشتر لەمعاویە نەبینیوە. خەڵك لەپەنای فرەزانی و خۆڕاگری ئەو بەسەر زەویەکی بەربلاّو و فراواندا زاڵبون و ئەو وەك ئەو پیاوە باریك بینە بیرتەسکە کەخێرا دەهاتە کوڵ، (عەبداللە کوڕی زوبەیر) نەبو.

صەفوان کوڕی عەمرۆ وتی: عەبدولەلیكِ کوڕی مەروان لەسەر گۆڕی معاویە وەستا و داوای لێخۆشبونی بۆ کرد. کەسێك لێی پرسی: ئەمە ئارامگای کێیە؟ وتی: ئارامگایی پیاوێك کەسوێند بەخوا تا ئەو جێگەی من دەزانم، لەروی زانستەوە قسەی دەکرد و لەرووی خۆڕاگریەوە بێدەنگی هەڵدەبژارد. کاتێك دەیبەخشی، دەوڵەمەندی دەکرد و کاتێك شەڕی دەکرد، لەناوی دەبرد. ئەوسا ڕۆژگار پەلەی کرد و ئەوەی بۆ داهاتوانی کۆکردبویەوە، بەوی بەخشی. ئەمە ئارامگای باوکی عەبدولرەحمان معاویەیە.

معاویە یەکەم خەلیفە بو لەئیسلامدا دوای خۆی بۆ کوڕەکەی بەیعەتی وەرگرت. یەکەم کەس بو دەزگای پەیك و نامە بردنی بنیاد نا. یەکەم کەس بو بۆنی خۆشی بە (غالیە) (گرانبایی) ناوبرد و بەوتەی دەستەیەك یەکەم کەس بو بەدانیشتانەوە وتاری دەخوێندەوە.

## وەرگرتنی بەیعەت بۆ یەزید

دەڵێن: لەمانگی ڕەجەبی ئەم ساڵە/ ئاوریلی ٦٨٠ زایینی خەڵك لەگەڵ یەزید بۆ خەلافەت دوای باوکی پەیمانیان بەست و ئەمە وەك ئاماژەی پێدرا هاورێیە لەگەڵ زۆر لەناسازگاریەکان و وتارە جۆراوجۆرەکانی مێژوونوسان کەپێشتر باسمان کرد. کاتێك هاتەسەر تەخت: کارگوزارانی شارەکان ئەمانە بون: وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی سوفیان لەمەدینە، عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاص لەمەککە، عوبەیداللە کوڕی زیاد لەبەسرە و نەعمان کوڕی بەشیر لەکوفە. هەمو هۆش و وتار و کرداری یەزید لەسەر ئەم بنەمایە هەڵدەسورا کە لەو چەند کەسەی لەبەرابەر باوکیدا خۆڕاگریان کردبو، بەیعەت وەربگرێت. نامەی بۆ وەلید نوسی و لەمەرگی معاویە ئاگاداری کردەوە. نامەیەکی کورت بو: دوای سلاّو، حسین و عەبداللە کوڕی عومەر و کوڕی زوبەیر بگرە

و بەیعەتیان لێ وەربگرە. گرتنێك كەهیچ دەربازبونێكی تیا نەبێت تا پەیمان ببەستن. سلاو و مالئاوا. كاتێك هەوالی مەرگی معاویەی پێگەیشت، شلەژا و ئەم كارە لای ئەو دژوار بو. كەسێك بەدوای مەروان كوڕی حەكەمدا ڕەوانە كرد. مەروان پێشتر لەلایەن وەلیدەوە فەرمانداری مەدینە بو. كاتێك وەلید هاتە ئەم شارە، مەروان بەناچاری هاتوچۆی دەكرد. كاتێك وەلید ئەمەی بینی، لای هاونشینەكانی خۆی جوێنی پێدا. مەروانیان ئاگادار كردەوە و ئەو لەوەلید پچڕا تا كاتێك هەوالی مەرگی معاویە گەیشت. مەرگی ئەو بۆ وەلید دژوار بو وكاتێك فەرمانی وەرگرتنی پەیمان لەو چەند كەسەی بەدەست گەیشت، كەسێكی بەدوای مەرواندا ڕەوانە كرد. كاتێك مەروان نامەكەی خوێندەوە وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). خوا لێی خۆشبێت. وەلید لێی پرسی كەدەبێت چی بكرێت. مەروان وتی: هەر ئێستا بانگیان بكە و فەرمان بدە كەدەبێت پەیمان بدەن كەئەگەر ڕازی بون، ئازادیان بكە وئەگەر ڕازی نەبون بیانكوژە پێش ئەوەی لەمەرگی معاویە ئاگادار ببنەوە، چونكە ئەگەر ئەوان لەمەرگی معاویە ئاگادار ببنەوە، هەر كام لەناوچەیەك شۆڕش دەست پێدەكەن و خەلك لەدەوری خۆیان كۆدەكەنەوە. كوڕی عومەر، نایەوێت فەرمانڕەوایەتی خەلك بكات مەگەر ئەوەی بۆ ئەم كارە هانبدرێت، لەبەر ئەمە ئەو خوازیاری شەڕ نیە. ئەگەر شتێك بەرێكەوت بكەوێت بەردەمی، هەلیدەگرێت و گەرنا سەرقالی كاری خۆیەتی.

وەلید، عەبداللە كوڕی عەمرۆ كوڕی عوسمان كەگەنجێكی تازەپێگەیشتبو، بۆلای حسین كوڕی عەلی و عەبداللە كوڕی زوبەیری نارد و ئەم دوانەی بانگ كرد. ئەو بینی ئەم دوانە پێكەوە لەمزگەوت دانیشتون. كاتێك ڕۆشتە لای ئەوان كەوەلید بۆ بینینی خەلك لەمالەوە دانەدەنیشت. وتی: هەردوكتان بڕۆنە لای فەرماندار. وتیان: بڕۆ، دێین. كوڕی زوبەیر بەحسین كوڕی عەلی وت: ئەو لەم كاتەدا چاوی بەكەس ناكەوێت، بەبڕوای تۆ بۆ چ كارێك ئێمەی بانگ كردوە. حسین كوڕی عەلی وتی: گومانم ئەوەیە كەسەركردەی ستەمكاری ئەوان مردوە و ئەو داوای لەئێمە كردوە تا پێش بلاو بونەوەی هەوالەكە پەیمانمان لێ وەربگرێت. كوڕی زوبەیر وتی: منیش ئەو گومانەم هەیە، دەتەوێت چی بكەیت؟ حسین وتی: گەنجەكانی خۆم كۆدەكەمەوە و دەڕۆمە لای

ئەو و ئەوان لەبەر دەرگا دادەنێم. من لەتۆ دەترسم چونکە ئەگەر بەتەنیا بڕۆیت دەترسم زیانت پێ بگەیێنێت. عەبدالله کوڕی زوبەیر وتی: ناڕۆمە لای مەگەر ئەو کاتەی دڵنیا بم دەتوانم پارێزگاری لەخۆم بکەم.

حسین کوڕی عەلی هەستا و کەس و هاورێیانی خۆی کۆکردەوە و بەرەو کۆشکی وەلید بەڕێکەوت و بەهاورێکانی خۆی وت: من دەڕۆمە ناو ئەگەر بەدەنگی بەرز هاوارم کرد یا بانگی ئێوەم کرد، هەموتان وەرنەژور وەگەرنە لەشوێنی خۆتان مەجوڵێن تا بۆ لای ئێوە دەگەڕێمەوە. ڕۆشتە ژوور و سڵاوی کرد و مەروان دانیشتبو. حسین وتی: بەهێزی پەیوەندی خزمایەتی باشتر لەپچراندنیەتی وئاشتی باشترە لەشەڕ. کاتی ئەوە هاتوە ئێوە دوانە ببنە هاودەستە، خوا چاکە لەنێوان ئێوەدا بکاتە فەرمانڕەوا. دانیشت. وەلید نامەکەی خوێندەوە و هەواڵی مەرگی معاویەی پێدا و داوای لێکرد بەیعەت ببەستێت. حسین کوڕی عەلی وتی: هەموان لەلای خواوە هاتوین و هەموان بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦) خوا لێی خۆش بێت. بەڵام سەبارەت بەبەستنی پەیمان، دەبێت بڵێم کەسێکی وەك من بەنهێنی پەیمان نابەستێت و لەو بەپەیمان بەستن بەنهێنی ڕازی نابن. کاتێك ڕۆشتیتە لای خەڵك و داوای پەیمانت لەوان کرد، داوای پەیمانیش لەنێمە بکە تا کارەکەت هاوئاهەنگ و سازگار بێت. وەلید کەخوازیاری ئارامی و تەندروستی بو، وتی: بگەڕێرەوە. مەروان وتی: ئەگەر ئێستا لەتۆ جیا ببێتەوە و پەیمان نەبەستێت، هەرگیز ناتوانی بەسەر ئەودا زاڵ بیت مەگەر ئەوەی لەنێوان ئێوە و ئەودا کەسانێکی زۆر بکوژرێن. بیخەرە زیندانەوە، ئەگەر پەیمانیدا ئازادی بکە و ئەگەر نا، بیکوژە. لەم کاتەدا حسین کوڕی عەلی لەشوێنەکەی هەستا و وتی: ئەی کوڕی ژنی چاوڕەش! تۆ من دەکوژیت یا ئەو دەمکوژێت؟ سوێند بەخوا درۆدەکەیت و پەستیت! دواتر ڕۆشتەدەر و گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی.

مەروان بەوەلیدی وت: نافەرمانی منت کرد، سوێند بەخوا هیچ کات کۆبونەوەیەکی لەمشێوە ئێوە کۆناکاتەوە. وەلید وتی: ئەی مەروان کەرەکەی خۆت بلەوەڕێنە! سوێند بەخوا نامەوێت هەمو ئەو شتەی خۆر بەسەریدا دەدرەوشێتەوە یا ئەو شتەی خۆر درەوشانەوەی خۆی لێ دەشارێتەوە، لەدارایی و سامانی ئەم جیهانە هی من بێت و حسین لەسەر پەیمان نەبەستن لەگەڵ یەزید بکوژم یا ئازاری بدەم. باوەڕم وایە ئەو

کەسەی حسین بکوژێت، لەرۆژی هەستانەوە لای خوا ترازوێکی زۆر سوکی هەیە.
مەروان وتی: راستت وت. ئەمەی وت بەڵام لەناخی خۆیدا وەلیدی بۆ کارەکەی سەرکۆنە دەکرد.

بەڵام کوڕی زوبەیر، وتی ئێستا دێمە لاتان. دواتر گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی و خانەنشین بو و دەرگای لەسەر خۆی داخست. وەلید کەسێکی بەشوێندا نارد و بینی هاوڕێکانی خۆی کۆکردۆتەوە و پشتی بەوان ئەستورە. وەلید پێداگری دەکرد و کوڕی زوبەیر دەیوت، کاتی زیاترم پێبدەن. وەلید هاورێکانی خۆی بەدوای ئەودا رەوانە کرد کەجوێنیان پێدا و ۆتیان: ئەی کوڕی ژنی کاهلی، وەرە بۆ لای فەرماندار وەگەرنە دەتکوژێت! عەبداللە کوڕی زوبەیر بەوانی وت: سوێند بەخوا ئەوەندە خەڵکتان بەشوێن مندا رەوانە کرد کەگومانم لا دروست بوە. پەلەم لێمەکەن هەر ئێستاکە کەسێك بۆ لای فەرماندار رەوانە دەکەم تا بزانم چی دەوێت. ئەو براکەی جەعفەر کوڕی زوبەیری بۆ لای وەلید رەوانە کرد کەوتی: خوا لێت خۆش بێت، واز لە عەبداللە بێنە چونکە ئەوت ترساندوە و تۆقاندوتە. بەخوساتی خوا بەیانی دێتە لای تۆ. نێردراوەکانت بانگکەرەوە تا لەدەوری ئەو بلاوەی لێبکەن. ئەو کەسی بەدوای نێردراوەکانی خۆیدا رەوانە کرد و ئەوانی گەڕاندەوە. کوڕی زوبەیر هەمان شەو هاورێ لەگەڵ براکەی، لەمەدینە هاتنەدەر و رێگەی (فورع)ی گرتەبەر و بەرەو مەککە بەرێکەوت. وەلید چەندین کەسی بەدوای ئەواندا رەوانە کرد بەڵام بەوان نەگەیشتن. گەڕانەوە و ئەو شەوە خۆیان بەحسین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە سەرقاڵ کرد. دواتر مەروان کەسی بەدوای حسیندا رەوانە کرد کەوتی: تا بەیانی چاوەڕێ بکەن، ئێوە ورد ببنەوە و ئێمەیش ورد دەبینەوە تا بزانین دەرگا بەکام لادا دەسورێت. لەبەر ئەوەی بەنەرمی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکرد، ئەو شەوە وازیان لێ هێنا.

حسین کوڕی عەلی هەمان شەو بەرێکەوت. عەبداللە کوڕی زوبەیر شەوێك پێش ئەو رۆشتبو. ئەو کوڕەکان و براکان و برازاکان و هەمو خزم و کەس و کارەکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت جگە لەمحەممەد کوڕی حەنیفە کەپێی وت: ئەی براکەم، تۆ خۆشەویستترینی خەڵکان لای منیت و رێزدارترینی هەموان لای من. من چاکەخوازیم لەکەس درێغ ناکەم بەتایبەت لەتۆ چونکە شیاوترین کەسیت. خۆت لەپەیمان بەستن

لەگەڵ یەزید و شارەکانیتر بەدور بگرە و تا ئەو شوێنەی دەتوانی لەم ئاژاوە دورەپەرێز بێستە. نێردراوەکانت بۆ لای خەڵکان رەوانە بکە و ئەوان بۆ شوێنکەوتنی خۆت هانبدە. ئەگەر پەیمانیان لەگەڵ بەستیت، سوپاسی خوا بکە و ئەگەر لەگەڵ کەسێکیتر پەیمانیان بەست، خوا بەم کارە دین و ئاوزی تۆ کەم ناکاتەوە و جوامێری و لەپێشی تۆ لەناوناچێت. من دەترسم بڕۆیتە شارێك و کەسانێك دەوری تۆ بگرن بەلاَم خەڵك لەسەر شوێنکەوتنی تۆ گیرۆدەی بەربلاَوی و دوبەرەکی ببن، دەستەیەك لەگەڵ تۆ و دەستەیەك دژی تۆ. ئەوسا شەڕ رودەدات و تۆ دەبیتە ئامانجی یەکەم ڕمەکان و لەم کاتەدا دەبینرێت باشترین هەمو خەڵکان لەروانگەی دایك و باوکە، بۆ پێشێلکراوترینی ئەوان لەروانگەی خوێن و بێ پەناگەیی ژن و منالّ و کەسەکانی بێت. حسین وتی: براکەن، بۆ کوێ بڕۆم؟ محەممەد وتی: برۆ مەککە ئەگەر لەوێ ئارامش بەدەست بێنیت، باشترە وئەگەر بڕۆیتە زیخەلاَن و دۆڵەکانی کوێستان، لەشارێکەوە بۆ شارێکیتر بڕۆیت با بزانیت کاروباری خەڵك لەسەر چ بنەمایەك ئارام دەبێتەوە و لەم کاتەدا باوەڕی تۆ بۆ بۆچونی راست بەهێز دەبێت. تۆ کاتێك بەهێزترینی بۆچونەکان و دورئەندێشترینی ئاوزەکانت دەبێت کە پێشوازی لەکارەکان بکەیت و هەرگیز کارەکان لەوە دژوارتر نابێت کەئەگەر بەدوای پێشهاتەکاندا بڕۆیت. حسین کوڕی عەلی وتی: براکەم، چاکەت لەگەڵ کردن و هیوادارم بەخواستی خوا، بۆچونی تۆ بەهێز و کاری تۆ بەسەرکەوتن کۆتایی بێت. دواتر حسین کوڕی عەلی ڕۆشتە ناو مزگەوت و ئەم هۆنراوەی یەزید کوڕی موفەرەغی خوێندەوە:

لا ذعرت السوام فی شفق الصبـ ـح مغيرا و لا دعيت يزيدا

يوم اعطى من المهانة ضيما و المنايا يرصدننی ان احيدا

یانی: هیچ کات مەرومالاَتی لەوەڕکەر لەکاتی بەرەبەیان و هێرش کردنە سەر سوپا، ناترسێنم و بەیەزید ناو نابرێم ڕۆژێك کەجامی ستەم و زۆرداریم بۆ تێبکەن و مەرگەکان بەدوای مندا بێن کەئەکا رێگەی خۆم خوار بکەم.

کاتێك حسین بەرەو مەککە بەرێکەوت، ئەم ئایەی خوێندەوە: موسا لەو شارەوە بەرێکەوت و ڕۆشتەدەر و چاوەڕوانی زیانی دەکرد و بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە، من لەدەست ستەمکاران رزگار بکە (قصص/٢١/٢٨). کاتێك ڕۆشتە ناو مەککە، وتی:

هیوادارم پەروەردگار من بۆ ڕێگەی راست ڕێنوێنی بکات (قصص/٢٨/٢٢).

دواتر وەلید کەسی بەدوای عەبداللە کوڕی عومەردا رەوانە کرد تا بێت و پەیمان ببەستێت. ئەو وتی: کاتێك خەڵك پەیمانیان بەست، پەیمان دەبەستم. دەستبەرداری ئەو بون چونکە لێی نەدەترسان. دەستەیەك دەڵێن: عەبداللە کوڕی عومەر و عەبداللە کوڕی عەباس لەمەککەدا بون و هاتنە مەدینە. حسین و عەبداللە کوڕی زوبەیر چاویان بەدوانە کەوت و پرسیان: چ هەواڵێکی تازەتان پێیە؟ وتیان: مەرگی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان و پەیمان وەرگرتن بۆ یەزید کوڕی معاویە. کوڕی عومەر وتی: ئێوە دوانە خەڵکان گیرۆدەی پەرتەوازەیی مەکەن. ئەو و کوڕی عەباس ڕۆشتن و کاتێك خەڵك پەیمانیان بەست، پەیمانیان بەست. دەڵێت: عەبداللە کوڕی زوبەیر ڕۆشتە مەککە و فەرماندارەکەی عەمرۆ کوڕی سەعید بو. کاتێك ڕۆشتە ناو مەککە، وتی: من پەنا بۆ ماڵی خوا دەبەم. نە لەنوێژەکانی ئەواندا بەشداری دەکرد و نە هیچ ئایینێکی حەجی لەگەڵ ئەواندا ئەنجام دەدا. ئەو و هاورێکانی لەسوچێکی جیاوازادا ئایینەکانی خواپەرستی خۆیان ئەنجام دەدا.

## لەسەرکار لابردنی وەلید لەمەدینە دانانی عەمرۆ کوڕی سەعید

لەم ساڵەدا یەزید وەلید کوڕی عوتبەی لەفەرمانڕەوایەتی مەدینە لابرد و عەمرۆ کوڕی سەعید ئەشەدەقی بۆ ئەو کارە دەست نیشان کرد. ئەو لەمانگی رەمەزان/ ژوئەنی ٦٨٠ زایینی گەیشتە ئەو شارە. خەڵکانی مەدینە لەدەوری کۆبونەوە. پیاوێك بو گەورە و رێزدار ( یا بەتەمەن وکارزان) ئەو عەمرۆ کوڕی زەبەیر کوڕی عەوامی کردە سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی چونکە ئەم پیاوە ڕقی براکەی خۆی یانی عەبدالله کوڕی زوبەیری لەدڵدا بو. سەرکردەی پاسەوانەکانی بۆ لای دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە رەوانە کرد و بانگی کرد و تا توانی ئیهانەی کردن چونکە عەبداللەی برای ئەویان خۆش دەویست، لەناو ئەوان: براکەی مونزەر کوڕی زوبەیر، کوڕەکەی محەممەد کوڕی مونزەر کوڕی زوبەیر، عەبدولرەحمان کوڕی ئەسوەد کوڕی یەغوس، عوسمان کوڕی عەبدالله کوڕی حەکیم کوڕی حیزام، محەممەد کوڕی عەمار کوڕی یاسر و کەسانیتر. یەکی چل یا شەست قامچی لەواندا.

عەمرۆ کوڕی سەعید لەگەڵ عەمرۆ کوڕی زوبەیر راوێژی کرد تا چ کەسێك بۆ لای عەبدالله کوڕی زوبەیر رەوانە بکات یا بۆ شەڕی ئەوی بنێرێت. وتی: کەس بۆ شەڕی ئەو نانێریت کە لەمن زیاتر دوژمنی ئەو بێت و زیاتر لێی بێزار بێت. خەڵکی لەگەڵ ئەودا کۆکردەوە و لەناو ئەواندا ئەنیس کوڕی عەمرۆ ئەسلەمی بو. ئەوان حەوتسەد پیاوی شەڕکەر بون. مەروان کوڕی حەکەم ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی سەعید و پێی وت: هێرش مەکەرە سەر مەککە، لەخوا بترسە و رێزی بارەگایی خوایی پێشێل مەکە. دەست بەرداری عەبدالله کوڕی زوبەیر ببن چونکە شەست ساڵی تەمەنە و پیاوێکی تێکۆشەر و لەسەر باوەڕەکەی خۆی سورە و تەمەنی خۆی بەسەر بردوە. عەمرۆ کوڕی زوبەیر وتی: سوێند بەخوا بەکوێرایی و ریسوایی چاوی ئەو کەسانەی نایانەوێت، هێرش دەکەینە سەر قولایی کەعبە و شەڕی لەگەڵ دەکەین.

ئەبو شورەیحی خوزاعی ڕۆشتەی لای عەمرۆ کوڕی سەعید (یا عەمرۆ کوڕی زوبەیر) و وتی: هێرش مەکەرە سەر مەککە چونکە من لەپێغەمبەرم بیست کەدەیفەرمو: فەرمانیان بەمنداوە کە لەماوەیەکی کورتدا لەرۆژ لەم شارەدا شەڕ بکەم و دواتر ئەو

شارە ڕێزداری خۆی پێ بەخشرایەوە. عەمرۆ وتی: ئەی پیرەپیاو، ئێمە باشتر لەتۆ ڕێز و گەورەیی ئەو شارە دەزانین.

دەستەیەك دەڵێن: یەزید بو فەرمانی بە عەمرۆ کوڕی سەعیددا تا عەمرۆ کوڕی زوبەیری عەوام بۆ شەڕی براکەی یانی عەبداللە کوڕی زوبەیر ڕەوانە بکات و ئەویش ئەم کارەی کرد و عەمرۆی بەسوپایەك پێکهاتوو لەدو هەزار پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد. ئە نیس لەزی تەوا دابەزی و عەمرۆ لەئەبتەح. عەمرۆ پەیامێکی بۆ براکەی نارد کە: سوێندەکەی یەزید بێنەرەدی (یەزید سوێندی خواردبو بەبەیعەتی عەبداللە رازی نابێت مەگەر ئەوەی زنجیر لەمل ببەنە لای. دەڵێن: لەوتەکەی ئەو ئەم وتارە زیاد کرابو: تا زنجیرێکی زیوین و نەبینراو بکەمە ملت، تا خەڵك شەڕی یەکیتر نەکەن چونکە تۆ لەشارێکی ڕێزار و پیرۆزدایت. عەبداللە کوڕی زوبەیر، عەبداللە کوڕی صەفوان بەسوپایەك لەهاوڕێیانی خۆی، لەوانەی کە لەمەککە دەوری ئەویان گرتبو، بۆ شەڕی ئەنیس ڕەوانە کرد. صەفوان ئەوی لە زی تەوا تێکشکاند و بریندارەکانی ئەوانی کوشتار کرد و ئەنیس کوڕی عەمرۆیش کوژرا. موصعەب کوڕی عەبدولرەحمان ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی زوبەیر. زۆرینەی هاوڕێیانی عەمرۆ لەدەوری ئەو بلاوەیان لێکرد و ئەو ڕۆشتە ماڵی کوڕی عەلقەمە کە لەوێ براکەی هات و پەنایدا. دواتر ڕۆشتە لای عەبداللە و وتی: من پەنای عەمرۆم داوە. عەبداللە وتی: ئایا لەماف خەڵکان پەنا دەدەیت؟ ئەمە کارێکە کەشیاو نیە و من فەرمانم بەتۆ نەداوە ئەم کەسە ناپاکە و پێشێل کەری ڕێز لێگیراوە خواییەکان پەنا بدەیت. دواتر عەمرۆی بازداشت کرد و سزای هەمو ئەو کەسانەی عەمرۆ لێیدابون، لەجەستەی هێنایەدەر و بەئەندازەی هەموی ئەوان قامچی لێدا جگە لەمونزەر و کوڕەکەی کە نەیانویست ڕقی عەمرۆ لەدڵ بگرن. عەمرۆ لەژێر قامچیەکاندا گیانی سپارد.

# پێڕست

## نامەنوسینی خەڵکانی کوفە بۆ حسین کوڕی عەلی کوژرانی موسلیم کوڕی عەقیل

کاتێك حسین لەمەدینە ڕۆشتەدەر، عەبدالله کوڕی موتیع چاوی پێی کەوت. پێی وت: گیانم قوربانی تۆ بێت، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ وتی: لەئێستادا بۆ مەککە دەڕۆم و بەڵام دوای ئەوە، داوای ڕێنوێنی و چاکە لەخوا دەکەم. عەبدالله وتی: هیوادارم خوا باشترینت پێ ببەخشێت، هیوادرام خوا هەمو ئێمە بکات بەقوربانی تۆ! کاتێك ڕۆشتیتە مەککە ئاگادار بە نەڕۆیتە کوفە چونکە شارێکی شوومە و باوکی تۆیان لەوێ کوشت و براکەتیان ریسوا کرد و ئەوەندەیان تانە و تەشەر لێدا نزیك بو گیانی دەربچێت. پەیوەستی بارەگایی خوایی بە و لەوێ سەروەری عەرەبەکان بە و حیجازیەکان کەس ناکەنە هاوتایی تۆ و خەڵك لەهەر لایێکەوە لەدەوری تۆ کۆدەبنەوە. مام و خاڵەکانی من قوربانی تۆبن! لەبارەگایی خوایی دورمەکەوەرەوە! سوێند بەخوا ئەگەر تۆ لەناو بچیت، هەموان لەگێژاویی ریسوایی و کۆیلایەتی نوقم دەبین.

حسین کوڕی عەلی بەرێکەوت تا لەمەککە دابەزی و خەڵك هاتوچۆ کردن بۆ لای ئەویان دەست پێکرد و لەهەر لایێکەوە دەوریان گرت. عەبدالله کوڕی زوبەیر لەوێ بو و سوچێکی کەعبەی کردبوە پەناگای خۆی. لەوێ بەردەوام لەسەر پێ بو و سەراسەری شەو ورۆژی بەنوێژ خوێندن بەسەر دەبرد و بەدەوری ماڵی خوادا دەسورایەوە و هاورێ لەگەڵ کەسانیتر دەڕۆشتە لای حسین کوڕی عەلی و بەردەوام راوێژی لەگەڵ دەکرد و هەندێ کات ئامۆژگاریشی دەکرد. حسین رێزدارترینی خەڵکان لای کوڕی زوبەیر بو چونکە تا ئەو کاتەی ئەو لەو شارەدا بو کەس لەگەڵ کوڕی زوبەیر بەیعەتی نەدەکرد.

کاتێك خەڵکانی کوفە لەمەرگی معاویە ئاگادار بونەوە و زانیان عەبدالله کوڕی عومەر و عەبدالله کوڕی زوبەیر و حسین کوڕی عەلی بەیعەتیان نەکردوە، لەبەرابەر یەزید شۆڕشیان دەست پێکرد. شیعەکان لەماڵی سلێمان کوڕی صوردی خوزاعی کۆبونەوە و ئاماژەیان بەرۆشتنی حسین کوڕی عەلی بۆ مەککەدا و لەلایەن چەند کەسێکەوە نامەیەکیان بۆ نوسی، لەناو ئەوان: سلێمان کوڕی صوردی خوزاعی، موسەییب کوڕی نەجبە، ریفاعە کوڕی شەداد، حەبیب کوڕی موتەهەر و کەسانیتر:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان، سڵاو لەتۆ. ئێمە لەگەڵ تۆ، سوپاسی خوایەك دەكەین كەجگە لەو خوایەك نیە. دوای سڵاو، سوپاسی خوایەك دەكەین كەدوژمنەكەی تۆی لەناو برد، ئەو دوژمنە ستەمكارە دێو سرشتەی كاروباری ئەم ئۆمەتەی لەدەست دەرهێنان و سامانەكانی تایبەت كرد بەخۆی و بەزۆر دەستی بەسەردا گرتن و بێ رەزامەندی خەڵكان فەرمانڕەوایەتی كرد و چاكەكانی كوشت و خراپەكارانی بەزیندویی هێشتەوە. ئێمە رێبەرێكمان نیە، بۆ لای ئێمە وەرە ئەگەری هەیە خوا لەروناكی تۆ، ئێمە لەدەوری راستی و دروستی كۆبكاتەوە. نەعمان كوڕی بەشیر لەكۆشكی فەرمانڕەوایی خۆی زەوی گیر بوە، ئێمە هیچ هەینی یا جەژنێك لەدەوری ئەو كۆنابینەوە و ئەگەر بزانین تۆ بەرەو لای ئێمە دێیت، ئەو دەردەكەین تا بەخواستی خوای گەورە ئەو بۆ شام دور بخەینەوە، سڵاو و خۆشەویستی و پیرۆزیەكانی خوایی هاورێی تۆ بن.

نامەكەیان هاورێ لەگەڵ عەبداللە كوڕی سەبعی هەمەدانی و عەبداللە كوڕی وال رەوانە كرد. دواتر نامەیەكی تریان نوسی و دوای دو شەو رەوانەیان كرد. خەڵك نزیكەی سەد و پەنجا نامەیان نوسی. دواتر نێردراوی سێیەمی رەوانە كرد وپێداگریان كرد تا بەرەو لای ئەوان بەرێكەوێت. دواتر شەبس كوڕی رێبعی و حەجار كوڕی ئەبجەر و یەزید كوڕی حارس و یەزید كوڕی رویەم و عوروە كوڕی قەیس و عەمرۆ كوڕی حەجاجی زەبیدی و محەممەد كوڕی عومەیری تەمیمی لەمبارەوە نامەیان بۆ نوسی.

كاتێك ئەم نامانە لای حسین كوڕی عەلی كۆبونەوە، بۆ ئەوانی نوسی: دوای سڵاو، هەموی ئەوەی نوسیبوتان، پێم گەیشت. ئێستا برا و كوڕە مام و كەسێكی بڕواپێكراوی خۆم لەبنەماڵەكەی خۆم موسلیم كوڕی عەقیل بۆ لای ئێوە رەوانە كرد و فەرمانم پێدا چۆنیەتی كار و ئەندێشە و چارەنوسی ئێوەم بۆ بنوسێت. ئەگەر بنوسێت كەبۆچونی گەورەكان و فرەزانەكانتان وەك بۆچونی ئەو نێردراوانەیە كە بۆ لای منتان رەوانە كردوە، بەزویی بەخواستی خوا بەرەو لای ئێوە بەرێ دەكەوم. سوێند بەگیان خۆم رێبەر تەنیا ئەو كەسەیە كەپشت بەنوسراوی خوایی ببەستێت و لەسەر بنەمایی دادپەروەری فەرمانڕەوایەتی بكات و ئایینی راستی و دروستی سەقامگیر بكات. سڵاو و ماڵئاوا.

دەستەیەك لەشیعەكان لەبەسرە لەماڵی ژنێك لەعەبدقەیس بەناوی ماریە كچی سەعد كۆبونەوە. ئەم ژنە لەسەر ئایینی شیعە بو. ماڵی ئەو پەناگای شیعەكان بو كەلەوێ

کۆدەبونەوە و راوێژیان دەکرد. یەزید کوڕی بونیت برپاریدا هاورێ لەگەڵ حسین کوڕی عەلی بڕواتەدەر. ئەو لەعەبدقەیس و دە کوڕی هەبو. پرسی: کام یەك لەئێوە لەگەڵ مندا دێت؟ دوان لە کوڕەکانی ئامادەیی خۆیان نیشاندا: عەبداللە کوڕی یەزید و عوبەیداللە کوڕی یەزید. ئەوان بەرێکەوتن و لەمەککە لای حسین دابەزین و دواتر لەگەڵ ئەو ڕۆشتن و لەگەڵ ئەو کوژران.

حسین کوڕی عەلی موسلیم کوڕی عەقیلی بانگ کرد و ئەوی بۆ کوفە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەخوا بترسێت و ئەم ئەرکەی بەنهێنی بهێڵێتەوە و نەرمی ومیهرەبانی بگرێتەبەر. موسلیم روی کردە مەدینە و لەمزگەوتی پێغەمبەری خوا نوێژی خوێند و لەگەڵ کەسەکانی خۆی ماڵئاوایی کرد و دو رێنیشاندەری لەخەڵکی قەیس بەکرێ گرت. ئەو دوانە رێگەیان ون کرد و تینویەتی تەنگی پێ هەڵچنین و لەئەنجامدا گیانیان سپارد و وتیان: ئەم رێگایە دەگاتە ئاو. موسلیم بۆ حسینی نوسی: من روم کردە مەدینە و دو رێنیشاندەرم بەکرێ گرت کەرێگەیان ون کرد و لەتاو تینویەتی گیانیان سپارد. ئێمە بەرێکەوتین تا گەشتینە ئاو و گیانی خۆمان رزگار کرد. ئەم ئاوە لەشوێنێك بەناوی (مضیق) (تەنگانە) لەدۆڵی (خبیت) (چاڵێکی قووڵ)ە. بۆ ئەم روداوانە بۆچونێکی خراپم هەیە. ئەگەر ئەتەوێت، لەمن خۆشبە و کەسێکیتر رەوانە بکە. حسین نوسی: دوای سڵاو، دەترسم هۆکاری تۆ بۆ نوسینی ئەو نامە شتێك جگە لەترسی تۆ نەبێت. بەرێگای خۆتا برۆ، درێژە بەکارەکەی خۆت بدە، ماڵئاوا.

موسلیم بەرێکەوت تا گەیشتە کوفە و لەماڵی موختار یا لەشوێنێکیتر دابەزی. شیعەکان هاتوچۆیان بۆ لای ئەو دەست پێکرد. هەرجار کەدەستەیەك لای ئەو کۆدەبونەوە، نامەکەی حسینی بۆ دەخوێندنەوە و ئەوان دەگریان و مژدەی هاوکاری و پشتیوانیان پێدەدا. شیعەکان ئەوەندە هاتوچۆیان کرد کەشوێنەکەی ئاشکرا بو و ئەم هەواڵە بەگوێی نەعمان کوڕی بەشیر فەرمانداری کوفە گەیشت. ئەو ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: دوای سڵاو، ئاژاوە و دوبەرەکی دەست پێمەکەن. چونکە لەم دو کارەدایە خەڵکان لەناو دەچن و خوێنەکان دەرژێن و سامانەکان بەفیرۆ دەروات. ئەو پیاوێکی خۆپارێز و خۆڕاگر بو و ئارامی و تەندروستی خۆش دەویست. دواتر وتی: من تەنیا شەڕی ئەو کەسە دەکەم کە شەڕی من بکات و تەنیا هێرش دەکەمە سەر کەسێك کەهێرش بکاتە

سەرم. خەوتوی ئێوە بەئاگا ناهێنمەوە و زیان لەئێوە نادەم و لەسەر بنەمای هەواڵ و بوختانەکان و بەدگومانی کەس دەستگیر ناکەم. بەڵام ئەگەر روبەروی من ببەنەوە و بەیعەتەکەم پێشێل بکەن و لەگەڵ رێبەرەکەی خۆتان ناسازگاری بگرنەبەر، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نیە، تا ئەو کاتەی دەسکی شمشێر لەدەستمدا بێت، شەڕی ئێوە دەکەم ئەگەریش لەناو ئێوەدا کەس یار و هاوکاری من نەبێت. ئاگادار بن کە من حەز دەکەم ئاشناکان بەراستی و دروستی لەناو ئێوەدا زیاتر لەو کەسانە بن کەبەدوای چەوتی و خواریدا دەگەڕێن.

لەم کاتەدا عەبداللە کوڕی موسلیم کوڕی سەعیدی حەزرەمی لەهاوپەیمانەکانی ئومەوییەکان لەبەرابەر ئەو هەستا و وتی: ئەم ئاژاوە تەنیا بەسەختگیری کۆتایی دێت و ئەم بۆچونەی تۆ هەتە، بۆچونی پیاوێکی لاوازە. نەعمان وتی: ئەگەر لاواز بم و فەرمانەکانی خوا ئەنجام بدەم، زیاترم پێخۆشەوە لەوەی لەبەرێزەکان بم و گوناح ئەنجام بدەم. ئەو لەسەر تەختی وتاردان هاتە خوار. عەبداللە کوڕی موسلیم نامەی بۆ یەزید نوسی و ئاگاداری کردەوە کە موسلیم کوڕی عەقیل هاتۆتە کوفە و خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ کردوە. بیری خستەوە: ئەگەر پێویستت بەکوفە هەیە، پیاوێکی بەهێز رەوانە بکە کە فەرمانی تۆ بەکار ببات و لەگەڵ دوژمنەکانت هاوشێوەی خۆت هەڵس وکەوت بکات چونکە نەعمان کوڕی بەشیر پیاوێکی لاواز و بێهێزە. ئەو یەکەم کەس بو نامەی بۆ یەزید نوسی و دواتر عومارە کوڕی وەلید کوڕی عوقبە و عەمرۆ کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص نامەی هاوشێوەیان بۆ یەزید نوسی.

کاتێك نامەکان لای یەزید کۆبونەوە، راوێژی لەگەڵ سێرجون کۆیلەکەی معاویە کرد و نامەکانی بۆ خوێندەوە و لێی پرسی چ کەسێك وەك فەرمانڕەوایی کوفە دەستنیشان بکات. یەزید لەعوبەیداللە کوڕی زیاد رەنجا بو. سێرجون پێی وت: ئەگەر معاویە زیندو دەبویەوە، بۆچونەکەی ئەوت بەکار دەبەست؟ وتی: بەڵێ. دەڵێت: سێرجون نامەی معاویەی سەبارەت بەدەست نیشان کردنی عوبەیداللە کوڕی زیاد وەك فەرمانڕەوایی کوفە نیشاندا و وتی: ئەمە بۆچونی معاویەیە. پێش ئەوەی بمرێت، فەرمانیدا ئەمە بنوسن. یەزید بۆچونەکەی معاویەی پشت راست کردەوە و کوفە و بەسرەی تایبەت کرد بەعوبەیداللە و فەرمانی خۆی لەمبارەوە نوسی و بەموسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی باوکی

قوتەیبە کوڕی موسلیم رەوانەی کرد و فەرمانیدا بەدوای موسلیم کوڕی عەقیلدا بگەڕێت و بیکوژێت یا لەکوفەوە بۆ شوێنێکی دوردەست، دوری بخاتەوە. کاتێك نامەکە بەعوبەیدالله گەیشت، فەرمانیدا بۆ ڕۆشتن ئامادە بن تا بۆ هەمان بەیانی ئاهەنگی کوفە بکات.

حسین رونوسێکی لەنامەکەی خۆی بۆ گەورەکانی بەسرە رەوانە کرد. نامەی بۆ ئەم کەسانە نارد: مالك کوڕی مێسمەعی بەکری، ئەحنەف کوڕی قەیس، مونزەر کوڕی جارود، مەسعود کوڕی عەمرۆ، قەیس کوڕی هەیسەم، عومەر کوڕی عەبدالله کوڕی مەعمەر و کەسانیتر. داوای فەرمانبەری لەنوسراوی خوا وشێوەی پێغەمبەری لێکردن و بیری خستنەوە کەشێوازی پێغەمبەر مردوە و بەلارێدا براوە و خراپەکاری زیندو بۆتەوە. هەمویان نامەکەی ئەویان شاردەوە جگە لەمونزەر کوڕی جارود کەترسا ئەمە فێڵی کوڕی زیاد خۆی بێت. لەبەر ئەمە نێردراوەکەی حسن و نامەکەی بردە لای کوڕی زیاد. ئەو نێردراوەکەی کوشت و لەناو خەڵکدا وتارێکدا و وتی:

سوێند بەخوا، هاوشێوەی ئەو کەسە نیم بۆمن ئاوازی مەشکەیەکی پڕبا بەرز بکەنەوە یا سەرکێشێك بکەنە هاوتایی من و دەستەمۆی بکەن. من سەرکوتکەری ئەو کەسەم شەڕی من بکات. هەرکەس لەگەڵ قاریەکان لەسەر تیر هاویشتن کێبڕکێ بکات، ماڧ ئەوانی داوە. ئەی خەڵکانی بەسرە، ئاگادار بن کەسەرومری باوەڕداران منی وەك فەرمانڕەوایی کوفە دەست نیشان کردوە و من بەیانی بەرەو ئەوێ بەرێدەکەوم. براکەم عوسمان کوڕی زیاد وەك جێگری خۆم دەکەمە فەرمانڕەوایی ئێوە. لەشۆڕش و ناسازگاری خۆتان بەدور بگرن چونکە سوێند بەخوا هەواڵی ناسازگاری لەهەر کام لەئێوە بەمن بگات، ئەو لەگەڵ سەرومر و هاوتاکەی خۆی و سەرپەرستەکەی دەستبەجێ دەکوژم و نزیك بۆ تاوانی دورەکان دەگرم تا راست و بەهێز بن و لەناو ئێوەدا ناسازگار و ئاژاوەچی دروست نەبێت. من کوڕی زیادم. لەناو هەمو خەڵکانی سەر زەوی، لەگەڵ ئەودا هاوتام. هەروەها لەگەڵ مام و خاڵەکانیشم.

دواتر لەگەڵ موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی و شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی و پاسەوانەکان و کەسانی نزیکی خۆی لەبەسرە ڕۆشتەدەر. شەریك شیعە بو. دەڵێن: پێنەسد کەسی لەگەڵدا بو کەکەم کەم لێی جیابونەوە. یەکەم کەس کە لێی جیابویەوە،

شەریك بو. هیوایان دەبرد بۆ گرتنی ئەوان چاوەڕوان بێت و حسین پێش ئەو بگاتە کوفە. چاوەڕوانی هیچ کەسی نەکرد تا بەتەنیایی ڕۆشتە ناو کوفە. لای کوڕەکانەوە تێدەپەری و لەبەر ئەوەی دەمامکی بەستبو، گومانیان دەکرد کەحسینە و چونکە لەمە دڵنیا بون، دەیانوت: بەخێرهاتیت ئەی زادەی پێغەمبەری خوا! ئەو قسەی لەگەڵ ئەوان نەدەکرد. خەڵك لەماڵەکانی خۆیان بۆ بینینی ئەو دەهاتنەدەر. ئەم کارەی پێ ناخۆش بو. نەعمان کوڕی بەشیر ئەمەی بیست و دەرگای کۆشکی لەسەر داخست چونکە گومانی دەکرد ئەو بێ گومان حسینە. عوبەیدالله گەیشتە کۆشك و خەڵك بەدەم هاوار کێشانەوە هاورێیەتیان دەکرد. نەعمان پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا لەمن دورکەویتەوە! ئەوەی بەمن سپێردراوە تەسلیمی تۆی ناکەم و ناخوازم شەڕی تۆ بکەم! عوبەیدالله لێی نزیك کەوتەوە و وتی: دەرگا بکەرەوە هیوادارم هەمیشە داخراو بیت. پیاوێك کە لەپشت سەری بو ئەمەی بیست و بۆ لای خەڵك گەڕایەوە و وتی: ئەی هاوار ئەوە کوڕی مەرجانەیە! نەعمان دەرگای کردەوە و کوڕی زیاد ڕۆشتە ژوور. دەرگایان داخست و خەڵك بڵاوەی لێکرد. بەرەبەیانی ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان (یا هەمان ڕۆژ) و وتی: دوای سڵاو، سەروەری باوەڕداران، شارەکان و سنور و داراییەکانی ئێوەی بەمن سپاردوە. فەرمانی داوە مافی ستەملێکراوان بدەم و بێ بەهرەکان سامانێکی زۆریان پێ ببەخشم و ڕێز لەفەرمانبەر و گوێرایەڵەکانی ئێوە بگرم و گوناحکار و گومانداری ئێوە سزا بدەم. من فەرمانەکانی ئەو سەبارەت بەئێوە ئەنجام دەدەم و پەیمانەکەی ئەو سەبارەت بەئێوە دەهێنمە دی. لەگەڵ چاکەکاری ئێوە وەك باوکێکی چاکەکار هەڵس و کەوت دەکەم و شمشێر و قامچی من بەرووی کەسێکدا بەرز دەبێتەوە کە لەفەرمانەکانی من خۆی بەدور بگرێت و پەیمانەکەی من بشکێنێت. هەر کەس دەبێت ئاگای لەخۆی بێت.

دواتر هاتەخوار و هەڕەشەی لەسەران و گەورەکان و خەڵکانیتر کرد و وتی: نامەم بۆ بنوسن و ئاشناکان و دورەپەرێزەکان لەسەروەری باوەڕداران و حروریەکان و ئەو کەسانەی گومانی ناسازگاری و نافەرمانیان لێدەکەن، بەمن بناسێنن. هەرکەس سەبارەت بەوان نامەم بۆ بنوسێت، لەگوناح پاکە و هەرکەس نەنوسێت دەبێت بەڵێنی پەیمانی ژێردەستەکانی خۆی بەئێمە بدات کەهیچ کامیان ڕێگەی ناسازگاری ناگرنەبەر و قسەی ناراست ناکەن و تەنیا ڕەزامەندی ئێمەیان دەوێت و هەرکەس جگە لەمە بکات، ئەمانی

لەسەر هەڵدەگیرێت و گیان و خوێن و سامانەکەی بۆ ئێمە ڕەوا دەبێت. هەر سەرپەرستێك لەسنوری دەسەلاَتەکەی خۆی یەکێك لەدوژمنانی سەروەری باوەڕداران بدۆزرێتەوە کە بەئێمەی نەناساندبێت، لەبەردەرگای ماڵەکەی خۆی لەداری دەدەن و بەشی لەگەنجینە دەردێنن و لەشوێنێك لە( عمان الزارە) فرێی دەدەن. دواتر هاتەخوار.

موسلیم وتارەکەی عوبەیدالله‌ی بیست و لەماڵی موختار هاتەدەر و ڕۆشتە ماڵی هانیِ کوڕی عوروەی موڕادی، لەدەرگا ڕۆشتە ژور و داوای کرد تا هانی ببینێت. هانی بەرەو لای هاتەدەر و کاتێك ئەوی بینی، بەبونی ئەو ناڕاحەت بو. موسلیم پێی وت: هاتم بۆ لای تۆ تا پەنام بدەیت و میوانداریم بکەیت. هانی وتی: بارێکی قورست خستە سەرشانی من. ئەگەر نەدەهاتیتە ناو ماڵەکەم، حەزم دەکرد لای من بڕۆیتەدەر بەلاَم ئێستا ئەم پەنادانە یەخەی من دەگرێت. هانی ئەوی پەنادا و شیعەکان دەستیان بەهاتوچۆ بۆ ماڵی هانی کرد.

کوڕی زیاد یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بانگ کرد وسێ هەزار درەمی پێدا و وتی: بەدوای موسلیم کوڕی عەقیلدا بگەڕێ، هاورێکانی بناسە و بیدۆزەرەوە و لەگەڵ ئەواندا کۆببەرەوە، ئەم درەمانە بدە بەوان وپێیان بڵێ کەلەوانی و بەوردی گوێ لەهەواڵەکانی ئەوان بگرە. کۆیلە ئەو کاری کرد و لەمزگەوت لای موسلیم کوڕی عەوسجەی ئەسەدی دانیشت و بیستی کەخەڵکان دەڵێن: ئەم بۆ حسین کوڕی عەلی بەیعەت وەردەگرێت. ئەو نوێژی دەخوێند. کاتێك لەنوێژ تەواو بو، پێی وت: ئەی بەندەی خوا، من خەڵکی شامم کەخوا هاورێیەتی بنەماڵەی پێغەمبەرەکەی بەمن بەخشیوە. ئەمە سێ هەزار درەمە، دەمەوێت بەهۆیەوە چاوم بەو پیاوە بکەوێت کەدەڵێن هاتوە بۆ کوفە و بۆ کوڕی کچی پێغەمبەر بەیعەت وەردەگرێت. بیستومە کە دەستەیەك دەڵێن: تۆ لەگەڵ کاری ئەم بنەماڵەیە ئاشنایت. هاتمە لای تۆ تا ئەم سامانە وەربگریت و بمبەیتە لای گەورەکەی خۆت تا بەیعەتی لەگەڵ ببەستم. ئەگەر دەتەوێت، پێش ئەوەی چاوم بەو بکەوێت، خۆت بەیعەت لەمن وەربگرە.

موسلیم کوڕی عەوسەجە وتی: لەدیداری تۆ شادمانم و هیوادارم ئەوەی دەتەوێت، ببینیت وخوا بەهاورێیەتی تۆ هاوکاری بنەماڵەی پێغەمبەرەکەی بکات. حەزم نەکرد خەڵك زانیان من لەگەڵ ئەم کەسانەدام چونکە لەکوڕی زیاد و ستەمی ئەو دەترسم.

بەیعەت و سوێند و بەڵێنی لێوەرگرت تا لەگەڵ ئەودا ڕێگەی چاکەخوازی بگرێتەبەر و نهێنیەکەی بەنهێنی بهێڵێتەوە. چەند ڕۆژێك هاتوچۆی کرد تا موسلیم کوڕی عەقیلی نیشاندا.

لەم کاتەدا هانی کوڕی عوروە نەخۆش کەوت. عوبەیدالله کوڕی زیاد ڕۆشت بۆ لای تا هەواڵی بپرسێت. عومارە کوڕی عەبدی سەلولی پێی وت: باشترین هۆکاری کۆبونەوەی دەستەکەی ئێمە و باشترین فێڵی ئێمە کوشتنی ئەم ستەمکارەیە. ئێستاکە خوا دەستی تۆی بۆ سەر ئەو ناوەڵا کردوە، بیکوژە. هانی وتی: حەز ناکەم لەماڵەکەی مندا بکوژرێت. کوڕی زیاد هات و سەردانی کرد و دواتر ڕۆشت. هەمینەکی نەخایاند کەشەریك کوڕی ئەعوەر نەخۆش کەوت. ئەو سەردانی هانی کوڕی عورەی کردبو و لای کوڕی زیاد و فەرمانداەرەکانیتر ڕێزدار و شەیدایی بنەماڵەی عەلی بو. لەشەڕی صەفین شان بەشانی عەمار کوڕی یاسر شەڕی کردبو. عوبەیدالله پەیامی بۆ نارد کە: ئەمشەو دێم بۆ سەردانی تۆ. شەریك کوڕی ئەعوەر بەموسلیم کوڕی عەقیلی وت: ئەم پیاوە خراپەکارە ئەمشەو بۆ سەردانی من دێت. کاتێك دانیشت وەرە بیکوژە و دواتر بەرەو کۆشك بەرێکەوە کەهیچ کەس و هیچ ڕێگرێك نابنە ناستەنگ بۆ تۆ. ئەگەر لەم نەخۆشیە ڕزگارم بێت، دەڕۆمە بەسرە و کاروباری ئەو دیارە بۆ تۆ سامان دەدەم. کاتێك شەو داهات، عوبەیدالله هاتە سەردانی. موسلیم هەستا تا عوبەیدالله بێتە ژوور. شەریك پێی وت: ئاگاداربە لەدەستت ڕزگاری نەبێت. کاتێك دانیشت، وەرە ژوور و بیکوژە. هانی کوڕی عوروە وتی: حەز ناکەم لەماڵەکەی مندا بکوژرێت. عوبەیدالله هات و دانیشت لەشەریکی پرسی کە: چۆن ژیان دەبەیتە سەر؟ شەریك گفتوگۆی درێژ کردەوە. کاتێك شەریك بینی موسلیم بۆ کوشتنی عوبەیدالله نایێت، ترسا کاتیان لەدەست بڕوات. لەبەر ئەمە دەستی بەخوێندنەوەی ئەم هۆنراوەیە کرد:

ما تنتظرون بسلمی لا تحیوها     اسقونیها و ان کانت بها نفسی

یانی: دڵدارەکەم سەلما چی بەسەر هاتوە کەسلاوی بۆ نانێرن. دەرخواردی منی بدەن ئەگەر گیانم لەسەر ئەم کارە بەفیڕۆ بڕوات.

دو سێ جار ئەم هۆنراوەی خوێندەوە. عوبەیدالله وتی: چی بەسەر هاتوە؟ ئایا گومان دەکەیت کاروبارەکان شێواون؟ هانی وتی: بەڵێ، لەبەیانی زو تا ئێستا ئەم هۆنراوەی

لەسەر دەمە. عوبەیدالله ڕۆشت.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك شەریك وتی (دەرخواردی منی بدەن) و قسەی پەرێشانی هێنایە سەر زمان، مێهران هەستی بەپیلانەکە کرد و بەچاو ئیشارەی لەعوبەیدالله کرد کەهەستا. شەریك پێی وتی: ئەی فەرماندار، ئەمەوێت پێشینارەکانی دوای مردن بەتۆ بسپێرم. وتی: دەگەڕێمەوە. مێهران وتی: مەبەستی کوشتنی تۆی بو. عوبەیدالله وتی: لەماڵی هانی، ئەو شوێنەی هێشتا بەخشینەکانی باوکمی تیایە، چۆن؟ مێهران وتی: ڕاستی ئەوەیە کەپێم وتی.

کاتێك کوڕی زیاد هەستا و ڕۆشت، موسلیم کوڕی عەقیل لەحەشارگەکەی خۆی هاتەدەر. شەریك پرسی: بۆچی نەتکوشت؟ موسلیم وتی: دو شت ڕێگری لێ کردم: یەکێك ئەوەی کەهانی نەیدەویست لەماڵەکەی ئەودا بکوژرێت و ئەویتر گێرانەوەیەکی عەلی لەپێغەمبەری خوا کە باوەڕداربون ڕێگرە لەبەردەم کوشتنی لەناکاو. کەواتە نابێت هیچ باوەڕدارێك، باوەڕدارێکیتر بەشێوەیەکی نهێنی بکوژێت. هانی پێی وت: ئەگەر بتکوشتایە، خراپەکارێکی ستەمکاری ناباوەڕی فێڵبازت دەکوشت.

شەریك دوای ئەم ڕوداوە سێ ڕۆژ ژیا و دواتر مرد. عوبەیدالله نوێژی لەسەر خوێند. کاتێك عوبەیدالله زانی شەریك موسلمی بۆ کوشتنی ئەو هانداوە، وتی: ئیتر لەسەر جەستەی هیچ عێراقیەك نوێژ ناخوێنم. ئەگەر ئارامگای زیاد لێرەنەدەبو، گۆڕەکەی شەریکم هەڵدەدایەوە.

دواتر کۆیلەکەی کوڕی زیاد کەئەوی بەسامانەوە ڕەوانە کردبو، دوای مەرگی شەریك بۆ لای موسلیم کوڕی عەوسەجە هاتوچۆی دەکرد. موسلیم کوڕی عەوسەجە ئەوی بردە لای موسلیم کوڕی عەقیل و بەیعەتی لێوەرگرت و بەسامانەکەی ڕازی بو. بەردەوام بۆ لای ئەوان هاتوچۆی دەکرد و لەنهێنیەکانی ئەوان ئاگادار دەبویەوە و کوڕی زیادی ئاگادار دەکردەوە. هانی بەهۆی نەخۆشیەوە پەیوەندی بەکوڕی زیادەوە نەمابو. عوبەیدالله، محەممەد کوڕی ئەشعەس و ئەسما کوڕی خارجەی بانگ کرد. دەستەیەك دەڵێن: هاوڕێ لەگەڵ ئەوان عەمرۆ کوڕی حەجاجی زەبیدی بانگێشت کرد. لەهانی و ئەمانی پەیوەندی ئەو پرسیاری کرد. وتیان: نەخۆشە. وتی: بیستومە چاك بۆتەوە و لەبەر دەرگای ماڵەکەی خۆی دادەنیشێت. سەردانی بکەن وپێی بڵێن ئەوەی لەئەستۆیدایە،

پشت گوێی نەخات.

ئەم سیانە هاتنە لای هانی و وتیان: فەرماندار سەبارەت بەتۆ پرسیاری کردوە و وتویەتی کە: ئەگەر دەمزانی لەنەخۆشی رەنج دەبات، سەردانیم دەکرد. بیستویەتی لەبەردەگای ماڵەکەت دادەنیشیت. لەکەمتەرخەمی تۆ رەنجاوە و گۆشەگیری تۆ کارێکە پاشا پێی رازی نابێت. سوێندت دەدەین لەگەڵ ئێمە سەرکەویت و سەردانی کوڕی زیاد بکەیت. هانی جل و بەرگی لەبەر کرد و هاورێ لەگەڵ ئەوان سوار بو. کاتێك لەکۆشك نزیك کەوتنەوە، گیانی هەستی بە پیلانەکەی کوڕی زیاد کرد. بەحەسان کوڕی ئەسما کوڕی خارجەی وت:کوڕی براکەم، من لەم پیاوە دەترسم. تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: بۆ تۆ لەهیچ شتێك ناترسم، هیچ بەڵگە و بیانوێکی مەخەرە بەردەست. ئەسما ئاگاداری روداوەکان نەبو. محەممەد کوڕی ئەشعەس هەمو شتێکی دەزانی. دەڵێت: ئەو کەسانە رۆشتنە لای زیاد و هانی هاورێ لەگەڵ ئەوان. کاتێك کوڕی زیاد ئەوی بینی، بەدادیاری خۆی کوڕی شورەیحی وت: خیانەتکار بەقاچەکانی خۆی هاتە لای تۆ. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، عوبەیدالله وتی:

اريد حياته و يريد قتلى عذيرك من خليلك من مراد

یانی: من خوازیاری ژیانی ئەوم و ئەو دەیەوێت من بکوژێت، هاوەڵی تۆ لەهاورێکانت لەموورادە.

کوڕی زیاد رێزی لێ دەگرت. هانی وتی: چی رویداوە؟ وتی: ئەی هانی، ئەم ئاژاوانە کە لەماڵەکەی تۆ دژی سەروەری باوەڕداران و موسوڵمانان رێکدەخرێن، چین؟ موسلیمت هێناوە و لەماڵەکەی خۆت پەنات داوە و کەرەستەی شەڕ و پیاوانی شەڕکەری بۆ کۆدەکەیتەوە و گومان دەکەیت ئەم کارانە لای من بەنهێنی دەمێنێتەوە! هانی وتی: نەمکردوە. وتی: کردوتە. گفتوگۆ لەنێوان ئەوان درێژەی کێشا. کوڕی زیاد کۆیلەکەی خۆی بانگ کرد. ئەو هات و لەبەرابەر هانی وەستا. وتی: ئەمە دەناسیت؟ هانی تێگەیشت کەئەو سیخوڕ بوە. گێژ بو و کەوتە سەر زەوی. ماوەیەك گێژ و سەرگەردان مایەوە، دواتر ئارام بویەوە و وتی: گوێ لەمن بگرە و بەراستگۆم بزانە چونکە سوێند بەخوا درۆت لەگەڵ ناکەم. سوێند بەخوا نەمئەوم بۆ ماڵەکەم بانگ کردوە و نە لەکارەکانی ئاگادار بوم تا ئەوەی بینیم لەبەر دەرگای ماڵەکەم وەستا و چاوەڕوانی

فەرمانی منە تا بێتە ژوور. لەدەرکردنی شەرمم بو و لەبەر ئەمە پەنادانی کەوتە سەرشانم، بۆیە بردمە ماڵەکەی خۆم و ڕێزم لێگرت. ئەگەر دەتەوێت، بەڵێنت پێ دەدەم ئێستا دەڕۆم لەماڵەکەم دەری دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ. وتی: نە سوێند بەخوا. هەرگیز ناڕۆیت مەگەر ئەوەی بیهێنیت بۆ لای من. وتی: سوێند بەخوا هەرگیز میوانەکەم ناهێنم تا بیکوژیت.

کاتێك گفتوگۆ لەنێوان ئەوان درێژەی کێشا، موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی هەستا. لەکوفە جگە لەو هیچ کەسێك لەخەڵکانی شام یا بەسرەی لێ نەبو. وتی: ڕێگە بدە لە گەڵ هانی قسە بکەم. بینی هانی سەرسەختی دەکات. هانی بردە سوچێك و کوڕی زیاد هەردوکیانی دەبینی. پێی وت: ئەی هانی، سوێندت دەدەم بەخوا خۆت بەکوشتن نەدەیت و گرفتاری بۆ خەڵکەکەت دروست نەکەیت! ئەم پیاوە کوڕە مامی ئەوانە و ئەوان نەدەیکوژن و نە ئازاری دەدەن. ئەو تەسلیم ئەوان بکە چونکە ئەم کارە بۆ تۆ ئەنگ نیە و هۆکارێك بۆ ئابروچون، چونکە ئەو رادەستی پاشا دەکەیت! وتی: سوێند بەخوا ئەمە هۆکاری شەرم وئابروو چونە. من تەندروستم و بازوی بەهێزم هەیە هاورێ لەگەڵ فراوانی هاورێیان. میوانەکەم رادەستی ئەوان ناکەم. سوێند بەخوا ئەگەر تەنیایش دەبوم تەسلیمم نەدەکرد مەگەر ئەوەی لەم ڕێگادا گیانم ببەخشم.

کوڕی زیاد گفتوگۆی ئەم دوانەی بیست. وتی: بیهێنن بۆ لای من. ئەویان بردە لای. وتی: سوێند بەخوا یا موسلیم دەهێنیت یا دەتکوژم. هانی وتی: ئەوکات شمشێرە درەوشاوەکان لەدەوروبەرت لەکالان دەردەکێشرێن. ئەو داماوە گومانی دەکرد خەڵکەکەی هاوکاری دەکەن. کوڕی زیاد وتی: من لەشمشێرە درەوشاوەکان دەترسێنیت؟

دەستەیەك دەڵێن: کاتی هانی سیخوڕەکەی عوبەیدالله کوڕی زیادی بینی، تێگەیشت کەئەو کوڕی زیادی لەرووداوەکان ئاگادار کردۆتەوە. وتی: ئەی فەرماندار ئەوەی بەتۆ گەیشتوە، ڕاستە و ڕویداوە. من بەخشینەکانی تۆ بۆ خۆم، بەفیڕۆ لەقەڵەم نادەم و بەفیڕۆی نادەم. تۆ دەتوانیت لەگەڵ بنەماڵەکەت بۆ هەر شوێنێك دەتەوێت، بڕۆیت. لەم کاتەدا عوبەیدالله سەری داخست و مێهران لەسەر سەری وەستابو و قامچیەکەی کورت کەشمشێر لەناویدابو، لەدەستیدا دەبینرا. وتی: ئەی هاوار لەریسوایی! ئەم جۆلایە تۆ لەسنوری پاشایەتیەکەت ئەمان دەدات! وتی: بیگرە. مێهران دوپرچی هانی گرت و

عوبەیدالله بەقامچیەکە لەسەر و روخساری دەدا تا ئەو جێگەی لوتی شکا و خوێن بەسەر جلەکانیدا بڵاوبویەوە و گۆشتی کوڵمەکان و ناوچاوی کەوتە سەر ریشی و قامچیەکە شکا. هانی دەستی بۆ دەسکی شمشێری یەکێك لەپاسەوانەکان درێژ کرد بەڵان رێگەیان نەدا دەستی پێی بگات. عوبەیدالله وتی: ئەی حروری، خۆت بویتە هۆکاری ئەم گرفتاریە و رشتنی خوێنی خۆتت بۆ ئێمە رەوا کرد. دواتر وتی: ئەویان خستە ناو ماڵێکەوە و دەرگایان لەسەر داخست.

ئەسما کوری خارجە هەستا و وتی: ئەی پیاوی پەیمان شکێن ئازادی کە؟ فەرمانت بەئێمەدا بیهێنین بۆ لای تۆ و کاتێك هێنمان، روخساریت تێکشکاند و خوێنیت باراند و دەڵێی دەیکوژیت. عوبەیدالله فەرمانی دا ئەویشیان گرت و خستیانە سەر زەوی. دواتر بەرەڵایان کرد و لەشوێنەکەی خۆی دانیشت. کوری ئەشعەس وتی: ئەوەی فەرماندار بخوازێت، پەسەندی دەکەین، چ لەزیانمان بێت، چ بەرژەوەندیمان.

لەولاوە عەمرۆ کوری حەجاجیان ئاگادار کردەوە کە هانی کوری عورو کوژراوە. ئەو هاورێ لەگەڵ مێزحەجیەکان گەیشت. ئەوان لەهەر لایەکەوە کۆشکیان گەمارۆدا. عەمرۆ هاواری کرد: من عەمرۆ کوری حەجاجم و ئەمانەیش سوارەکانی مێزحەجن. نەپشتمان کردۆتە فەرمانبرداری خۆمان نە لەهاورێیەتی کۆمەڵانی خەڵك خۆمان دورخستۆتەوە. عوبەیدالله بەشورەیحی قازی وت کە لەوێ ئامادە بو: برۆ لای هاورێی ئەم خەڵکە و سەیری بکە و دواتر لەزیندوبونی، ئەوان ئاگادار بکەرەوە. کاتێك شورەیح رۆشتە لای، هانی هاواری کرد: ئای موسوڵمانان! ئایا خەڵکەکەی من مردون؟ دینداران چیان بەسەر هاتوە؟ هاورێیانم چیان بەسەر هاتوە؟ ئایا من لەدەستی دژومنەکەی خۆیان و کوری دوژمنەکەی خۆیان رزگار ناکەن! ئەو هات و هاوارەکەی بیست و وتی: ئەی شورەیح، گومان دەکەم ئەمە هات وهاواری مێزحەجیەکان و شیعیەکانی من لەموسوڵمانانە. ئەگەر دەکەسیان بێن، دەتوانن من رزگار بکەن. شوریەح هاتەدەر و لەگەڵ ئەو کەسێکی دوزمان بو کە کوری زیاد کردبویە هاورێی. شورەیح وتی: ئەگەر ئەم دوزمانە لەگەڵم نەدەبو، ئەوانم لەوتەکانی هانی ئاگادار دەکردەوە. کاتێك شورەیح هانی بەجێهێشت، وتی: من سەیری هاورێکەی ئێوەم کرد و بینیم زیندوە و نەمردوە. عەمرۆ و هاوەڵانی وتیان: ئێستا کەنەکوژراوە دەبێت سوپاسی خوا بکەین، خوایە شوکرا دواتر رۆشتن و بڵاومیان لێکرد.

موسلیم کوڕی عەقیل ئەم هەواڵەی بیست و لەناو هاورێکانی خۆی وتی: (یا منصور امت) (ئەی سەرکەوتو، بمرێنە) ئەمە نهێنی شەڕی (دروشمی) ئەوان بو. هەژدەه هەزار پیاوی شەڕکەر بەیعەتیان لەگەڵ کردبو و لەماڵەکانی دەوروبەری ئەو نزیکەی چوار هەزار شەڕکەر کۆببونەوە. خەڵکانێکی زۆر لەدەوری وەو کۆببونەوە. موسلیم بۆ عەبدالله کوڕی عوزەیزی کیندی ئالآی شەڕی بەست و وتی: لەپێش منەوە بەرێکەوە. بۆ موسلیم کوڕی عەوسجەی ئەسەدی ئالآی بەست و ئەوی کردە سەرکردەی شەڕەکەرانی مێزحەج و ئەسەد. بۆ ئەبو سەمامە سایدی ئالآی بەست و ئەوی کردە فەرماندەی شەڕکەرانی تەمیم و هەمەدان. و بۆ عەباس کوڕی جەعدەی جەدەلی ئالآی بەست و ئەوی کردە فەرماندەی هێزە شەڕکەرەکانی مەدینە. دواتر روی لەکۆشك کرد. کاتێك ئەم هەواڵە بەکوڕی زیاد گەیشت کە موسلیم بەرەو کۆشك بەرێکەوتوە، لەوێ خۆی حەشاردا و دەرگاکانی لەسەر خۆی داخست. موسلیم کۆشکەکەی گەمارۆدا و بازار و مزگەوتەکان لێوانلێو بون لەخەڵك. خەڵك تا کاتی شەو بەردەوام زیادیان دەکرد. عوبەیدالله کەوتە تەنگانەوە چونکە لەناو کۆشکەکە زیاتر لەسی پاسەوان و بیست کەس لەگەورەکان و کەسانی بنەماڵە و هاورێکانی کەسیتری لێ نەبو. گەورەکان لەدرگای نزیك (ماڵی رۆمیەکان) لای کوڕی زیاد کۆبونەوە و خەڵك جوێنیان بەکوڕی زیاد و باوکی دەدا. کوڕی زیاد کەسیر کوڕی شەهابی حارسی بانگ کرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ شوێنکەوتوانی خۆی لەمێزحەج بڕواتەدەر و خەڵك لەدەوری موسلیم بڵاوە پێبکات و بیانترسێنێت. فەرمانی بەمحەممەد کوڕی ئەشعەسدا لەگەڵ شوێنکەوتوانی خۆی لەحەزرەمەوت و کێندە بڕواتەدەر و ئالآی ئەمان بۆ ئەو کەسانی لەدەوری ئەو کۆدەبنەوە، هەڵبکات، هەمان فەرمانی بەقەعقاع کوڕی شەوری زوهەلی و شبس کوڕی رێبعی تەمیمی و حەجار کوڕی ئەبجەری عێجلی و شەمر کوڕی زی ئەلجەوشنی زەبابی دا و کەسەکانیتری لای خۆی هێشتەوە تا لەگەڵ ئەوان ئارامی پێببڕێت چونکە کەسەکانی زۆر کەم بون.

ئەو چەند کەسە رۆشتنەدەر و خەڵکیان بۆ وازهێنان لەهاوکاری کردنی موسلیم کوڕی عەقیل ناچار کرد. عوبەیدالله فەرمانی بەگەورەکانی لای خۆیدا، لەسەرەوەی کۆشکەکە برۆنە لای خەڵك هیوا و هێز و مژدە بەفەرمانبەران بدەن و نافەرمانان بترسێنن و ترس لەناو ئەواندا دروست بکەن ( و بەمشێوەیە بارودۆخێکی پڕ مەترسیان دروست کرد). کاتێك خەڵك وتاری گەورەکانیان بیست، بڵاوەیان لێکرد. کار گەیشتە ئەو شوێنەی

کە ژنێك دەهات و دەستی کوڕ یا براکەی دەگرت و دەیوت: بگەڕێرەوە، خەڵکی بەئەندازەی پێویست لێیە . هەروەها پیاوانیش دەهاتن و ئەو کارەیان دەکرد. ئەوان یەك یەك بڵاوەیان لێکرد بەشێوەیەك کە لەمزگەوتەکە تەنیا سی کەس لەگەڵ کوڕی عەقیل مانەوە.

کاتێك ئەمەی بینی، روی لەدەروازەی کێندە کرد. کاتێك لەدەروازە تێپەڕی، کەسی لەگەڵدا نەمایەوە. لەکۆڵانەکانی کوفەدا دەسوڕایەوە و نەیدەزانی چی بکات و بۆ کوێ بڕوات. گەیشتە بەردەگای ماڵی ژنێك بەناوی (تەوعە). ئەمە ژنە دایکی منداڵ بۆ ئەشعەس کوڕی قەیس بو کەئازادی کرد و ئەسیدی حەزرەمی ئەوی وەك هاوسەر هەڵبژارد و ژن بۆ ئەو بیلال کوڕی ئەسیدی هێنایە دونیا. بیلال لەگەڵ خەڵك ڕۆشتبوەدەر و دایك چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەوی دەکرد. کوڕی عەقیل سڵاوی لەو ژنە کرد و داوای ئاوی کرد کەپێی دا و خواردی و دانیشت. وتی: ئەی بەندەی خوا، ئاوت نەخواردەوە؟ وتی: خواردم. ژن وتی: کەواتە بۆ لای کەس و کار و بنەماڵەکەت بگەڕێرەوە. پیاو بێدەنگ بو. ژن سێ جار قسەکەی دوبارە کردەوە و کوڕی عەقیل بەهەمان شێوە بێدەنگ بو. ژن وتی: پەنا بەرخوا! من بەڕەوای نازانم تۆ لەبەر دەرگای ماڵەکەم دانیشیت. پیاو وتی: من لەم شارە ماڵ یا بنەماڵەیەکم نیە. ئایا دەتەوێت چاکە و پاداشت بەتۆ بگات؟ ئەگەری هەیە ڕۆژێك لەرۆژان ئەم چاکەیەت قەرەبو بکەمەوە. ژن وتی: ئەمە چ بەسەرهاتێکە؟ پیاو وتی: من موسلیم کوڕی عەقیلم. ئەم خەڵکە درۆیان لەگەڵ کردم و فریویاندام. ژن وتی: وەرە ژوور. ژن ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی و پێشنیاری نانی ئێوارێی پێکرد بەڵام موسلیم نەیخوارد. دواتر بیلال گەڕایەوە و بینی دایکی زۆر بەماڵەکەدا هاتوچۆ دەکات. بەدایکی وت: تۆ لەو ژورە کارێکت هەیە. پرسیاری کرد و وەڵامی نەبیست. پێداگری کرد و دایك لەنهێنیەکە ئاگاداری کردەوە و داوای لێکرد بەنهێنی بیهێڵێتەوە. سوێندیدا و کوڕەکەی بێدەنگ بو.

بەڵام کوڕی زیاد کاتێك بینی هیچ دەنگێك بەگوێی ناگات، بەهاورێکانی وت، سەیر بکەن، ئایا کەس لەوان دەبینن؟ ئەوان سەیریان کرد و کەسیان نەبینی. ئەو کەمێك پێش سەرەتای شەو ڕۆشتە ناو مزگەوت و هاورێکانی خۆی لەدەوری تەختی وتاردان دانیشاند و فەرموی کە جاڕیاندا: ئەمان لەسەر هەمو پاسەوانەکان و سەرکردەکان و فەرماندەکان هەڵگیراوە مەگەر ئەو کەسانەی نوێژی خەوتنان لەمزگەوت بخوێنن. مزگەوت لێوانلێو بو لەخەڵك. ئەو نوێژی لەگەڵ خەڵك خوێند و دواتر هەستا و سوپاسی خوای کرد و

وتی: دوای سڵاو، کوڕی عەقیل ئەم پیاوە نەزانە، لەروی ناسازگاری و نافەرمانی روبەرومان بویەوە کەبینیتان. ئەمان لەسەر کەسێك هەڵگیراوە کە لەماڵەکەی ئەودا بدۆزرێتەوە بەڵام هەر کەس ئەو بهێنێت خوێنباییەکەی پێدەدەم. فەرمانی پێدان لەسەر فەرمانبردن پایەدار و لەسەر گوێرایەڵی بەهێز بن. فەرمانی بەحوصەین کوڕی تەمیمدا دەرگای کۆڵانەکان بگرێت و دواتر ماڵەکان بگەرێت. ئەو سەرکردەی پاسەوانەکان و لەبەنی تەمیم بو.

کوڕی زیاد ڕۆشتە ناو کۆشك و ئاڵای فەرماندەیی بۆ عەمرۆ کوڕی حورەیس بەست و ئەوی کردە فەرماندەی خەڵکان. کاتێك بەیانی داهات، بیلال کوڕی ئەسید (کوڕی ئەوژنەی پەنای بەموسلیم کوڕی عەقیلدا بو) بۆ لای عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس ڕۆیشت و لەشوێنی کوڕی عەقیل ئاگاداری کردەوە. عەبدولرەحمان ڕۆیشتە لای باوکی کە لەو کاتەدا لای کوڕی زیاد بو و بەهێواشی نهێنیەکەی بەگوێچکەیدا چرپاند. محەممەد کوڕی ئەشعەس ئەم هەواڵەی بەکوڕی زیاد راگەیاند. کوڕی زیاد پێی وت: هەستە و هەر ئێستا بیهێنە لای من. هاورێ لەگەڵ ئەو عەمرۆ کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەباسی سولەمی لەتەمیمیەکانی لەگەڵ حەفتا پیاوی شەڕکەر لەقەیسیەکان رەوانە کرد و ئەوان ڕۆشتنە ئەو ماڵەی کوڕی عەقیل خۆی تیا حەشاردابو. کاتێك دەنگە دەنگی بیست، زانی بۆ ئەو هاتون. شمشێری دەرکێشا و هێرشی کردە سەریان و ئەوانی لەماڵەکە دەرکرد. دوبارە گەڕانەوە و ئەوانی دەرکردەوە و ئەم کارە چەندین جار دوبارە بویەوە. بوکەیر کوڕی حیمرانی ئەحمەری گورزێکی لەدەمی موسلیمدا کەلێوی سەرەوەی بڕی و دو دیانی پێشەوەی شکاند. موسلیم شمشێری لەسەری و لەشانیدا و تا نزیك ورگی هەڵدڕی. کاتێك ئەمەیان بینی، ڕۆشتنە سەربانەکە و بەردبارانیان کرد و قامیشەکانیان ئاگردا وبەو شێوە تەنگیان پێهەڵچنی. موسلیم کاتێك ئەمەی بینی، شمشێری دەرکێشا و لەماڵەکە هاتەدەر و شەڕی دەست پێکرد. محەممەد کوڕی ئەشعەس وتی: ئەمانت پێ بەخشراوە، خۆت بەکوشتن مەدە! ئەو شەڕی دەست پێکرد و وتی:

| و ان رایت الموت شیئا نکرا | اقسمت لا اقتل الا حرا |
| --- | --- |
| رد شعاع الشمس فاستقرا | او یخلط البارد سخنا مرا |
| اخاف ان اکذب او اغرا | کل امریء یوما یلاقی شرا |

یانی: سوێند دەخۆم تەنیا وەك جوامێرەکان بمرم، ئەگەرچی مەرگ بەکارێکی سەخت و

دژوار دەزانم. یا ئەوەی گەرمی تاڵ تێکەڵ بەسارد بکەن یا تیشکی خۆر بەشێوەیەك بگەڕێننەوە کەلەشوێنەکەی خۆی ئارام بگرێت. هەر پیاوێك ڕۆژێك ڕوبەڕوی زیانی مەرگ دەبێتەوە، دەترسم درۆم لەگەڵ بکەن یا فریوم بدەن.

محەممەد کوڕی ئەشعەس پێی وت: نە درۆت لەگەڵ دەکەن نە فریوت دەدەن. ئەم خەڵکە کوڕە مامەکانی تۆن، نە دەتکوژن نە لێتدەدەن. هەمو گیانی بریندار و توانای شەڕکردنی نەمابو. ئەو پشتی بەدیواری ماڵەکەوەدا. کوڕی ئەشعەس و خەڵك ئەمانیان پێدا جگە لە عەمرۆ کوڕی عوبەیدالله سولەمی کە وتی: ( من لەم کارەدا هیچ وشترێکی نێر یا مێچکەم پێ نابڕێت). ئێسترێکیان هێنا و شمشێرەکەیان لێ سەند و سواریان کرد. وەك بڵێی هیوای بەژیان نەما و فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتەخوار. دواتر وتی: ئەمە یەکەم فریوە. محەممەد وتی: هیوادارم هیچ ترسێکت لەسەر نەبێت. موسلیم وتی: ئەمە هیوایەك زیاتر نیە، ئەمانی ئێوە چی بەسەر هات؟ عەمرۆ کوڕی عوبەیدالله سولەمی وتی: ئەو کەسەی بەدوای ئەو شتەدا بگەڕێت کە تۆگەڕایت، ئەگەر ئەو بەلای بەسەرتۆدا دێت، بەسەر ئەودا بێت، ناگریت! وتی: بۆ خۆم ناگریم بەڵکو بۆ کەسەکانم کەبەرەو لای ئێوە دێن، بۆ حسین و بنەماڵەی حسین. دواتر بەمحەممەد کوڕی ئەشعەسی وت: دەزانم تۆ ناتوانی ئەمان بەمن ببەخشیت، کەسێك بۆ لای حسین ڕەوانە بکە تا پێی بڵێت بگەڕێتەوە و فریوی خەڵکانی کوفە نەخوات چونکە ئەمانە هاوڕێکانی باوکی بون کە ئارەزوی دەکرد بەمەرگ یاکوژران لەدەستی ئەوان ڕزگاری بێت، ئایا دەتوانی ئەم کەسە بۆ لای حسین ڕەوانە بکەیت؟ کوڕی ئەشعەس وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە دەکەم. دواتر وتەکانی موسلیمی بۆ حسین کوڕی عەلی نوسی. نێردراو لە(زوبالە) چاوی بەحسین کوڕی عەلی کەوت و ئاگاداری کردەوە. حسین وتی: هەرچار کەپێشهاتێکی خوایی ڕوبدات، لەسەر خۆمان حسێبی دەکەین و بەگومڕایی خەڵکەکەی خۆمانی دەزانین.

هۆکاری هاتنەکەی لەمەککەوە بەرەو عێراق نامەکەی موسلیم بو کەدەیوت هەژدە هەزار پیاوی شەڕکەر بەیعەتیان لەگەڵ کردوە و پێداگری دەکرد حسین هەرچی زوتر بگاتە ئەو دیارە. بەڵام بەسەرهاتی موسلیم، محەممەد کوڕی ئەشعەس ئەوی بردە کۆشك بۆ لای کوڕی زیاد و ئاگاداری کردەوە کەئەمانی پێ بەخشیوە. عوبەیدالله وتی: تۆ چ کارێکت بەئەمان دانی ئەم هەیە! تۆمان ڕەوانە نەکرد ئەمانی پێبدەیت بەڵکو بۆ ئەوەمان ڕەوانە کردی بیهێنیت. کاتێك موسلیم لای دەرگای کۆشکەکە دانیشت، مەشکەیەك ئاوی فێنکی بینی. وتی: لەم ئاوەم پێ بدەن. موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی

پێی وت: دەبینی چەندە فێنکە! سوێند بەخوا یەك دڵۆپی ناخەیتە سەر زمان تا ئاگرەکانی دۆزەخ بچێژیت! کوڕی عەقیل پێی وت: تۆ کێیت؟ وتی: ئەو کەسەم کە راستی و دروستیم ناسی کاتێك تۆ پێشێلت کرد. خوازیاری چاکەی رێبەر و خەڵك بوم لەکاتێکدا تۆ خیانەتت لێکردن و فەرمانبردار و گوێرایەڵ بوم کاتێك تۆ نافەرمانی و گوناحت کرد، من موسلیم کوڕی عەمرۆم. کوڕی عەقیل پێی وت: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، چەندە ستەمکار و دڵرەق و بێ بەزەییت! تۆ ئەی کوڕی باهیلە، شیاوتری بۆ ئاگری دۆزخ و مانەوەی هەمیشەیی لەجەهەننەمدا! دەڵێت: عومار کوڕی عوقەبە ئاوێکی فێنکی هێنا و بۆی کردە قاپێك. موسلیم وەریگرت تا بیخواتەوە کە قاپەکە پڕبو لەخوێن. سێ جار ئەم کارەی کرد و نەیتوانی بیخواتەوە. وتی: ئەگەر رۆژی من دەبو، دەمتوانی بیخۆمەوە.

موسلیمیان بردە لای کوڕی زیاد. ئەو وەك فەرمانداد سلاوی بۆ کوڕی زیاد نەنارد. پاسەوانێك پێی وت: ئایا سلاو لەفەرماندار ناکەیت؟ موسلیم وتی: ئەگەر بیەوێت بمکوژێت، چ سودێك لەم سلاو کردنە؟ و ئەگەر بیەوێت نەمکوژێت، لەداهاتودا وتەی چاکەی زۆر لەمن دەبیستێت. کوڕی زیاد وتی: سوێند بەگیانی خۆم تۆ دەکوژرێیت! وتی: بەمشێوەیە؟ وتی: بەڵێ. وتی: کەواتە رێگەم بدە وەسیەت لای یەکێك لەکەسەکانم بکەم. وتی: بیکە. موسلیم بەعومەر کوڕی سەعدی وت: لەنێوان من و تۆ پەیوەندی خزمایەتی هەیە و من نیازێکم بەتۆیە کە نهێنیە. عومەر رازی نەبو بیبیستێت. کوڕی زیاد وتی: پشت مەکەرە نیازەکەی کوڕی مامەکەت. عومەر هەستا و لەگەڵ ئەودا رۆشتە سوچێك. موسلیم وتی: من قەرزێکم هەیە لەکوفە وەرم گرت و ئەمە لەکاتێکدا بو کە هاتمە ناو ئەم شارە. حەوتسەد درەمە. ئەو قەرزە بۆ من بدەرەوە. جەستەکەی من هەڵگرە و بەخاکم بسپێرە و کەسێك بۆ لای حسین رەوانە بکە و بیگەڕێنەوە.

عومەر کوڕی زیادی لەهەمو وتەکانی موسلیم ئاگادار کردەوە. کوڕی زیاد پێی وت: ئەمین خیانەت لەتۆ ناکات بەلام هەندێ کات خیانەتکار لەجیاتی ئەمین دەگرن. بەلام سامانەکەت، تایبەتە بەخۆت، هەر کارێك دەتەوێت بیکە، بەلام حسین، ئەگەر مەبەستی شەر لەگەڵ ئێمە نەکات، ئێمەیش مەبەستی شەڕ ناکەین، بەلام جەستەکەی بەکەس نابەخشین. دەستەیەك دەڵێن: وتی: بەلام جەستەکەی، دوای ئەوەی کوشتمان، ترسمان نیە چی لێ دەکەن.

دواتر بەموسلیمی وت: ئەی کوڕی عەقیل، تۆ خەڵکت هاندا کاتێك سەبارەت بەچارەنوس

و فەرمانڕەوایی خۆیان هاودەنگ و سازگار بون و قسەیان یەك تا ئەوان لەیەك جیا بکەیتەوە و دوبەرەکی لەناو ئەواندا دروست بکەیت! موسلیم وتی: سوێند بەخوا هەرگیز! وتاری خەڵکی ئەم شارە ئەوەبو کە باوکی تۆ چاکەکارانی ئەوانی کوشت و خوێنی زۆری ڕشت و هاوشێوەی سێزار و خوسرەو فەرمانڕەوایەتی ئەوانی کرد. ئێمە هاتین تا دادپەروەری و بەکار بردنی نوسراوی خوایی و شێوازی پێغەمبەریان پێ پێشنیار بکەین. کوڕی زیاد وتی: ئەی خراپەکار، ئایا ئەو کاتەی لەمەدینە شەرابت دەخواردەوە، ئەم کارانە ئەنجام نەدەدران؟ موسلیم وتی: من و شەراب خواردن؟ سوێند بەخوا، خوا دەزانێت تۆ درۆ دەکەیت و  من بەو شێوە نیم کە باست کردم. شیاوترینی خەڵك بۆ شەراب خۆری کەسێکە لەخوێنی موسوڵمانانندا مەلە بکات و لەسەر بنەمایی تووڕەیی و دوژمنایەی ئەو گیانە پاکەی خواوەند رێزدار و ناڕەوای کردەوە، دەگرێت و گاڵتە و گەمە دەکات وەك بڵێی هیچ کارێکی ئەنجام نەداوە. کوڕی زیاد وتی:  خوا بمکوژێت ئەگەر بەشێوەیەك نەتکوژم کە تا ئێستا کەس بەو شێوەیە لەئیسلامدا نەکوژرابێت! موسلیم وتی: بەڵێ، تۆ شیاوترین کەسی کارێك ئەنجام بدەیت کە هیچ پێشینەیەکی لەئیسلامدا نەبێت. تۆ کوشتن بەشێوەی قێزەون و بڕینی گوێ و لوت و لەت لەت کردنی جەستە و کرداری قێزەون و زاڵبونی بێ بەزەییانە هیچ کات لەبیر ناکەیت و هیچ کەس لەناو موسوڵمانان لەتۆ بۆ ئەم کارە شیاوتر نیە. کوڕی زیاد جوێنی بەعەلی و حسین و موسلیم و عەقیلدا بەڵام موسلیم وەڵامی نەدایەوە. دواتر فەرمانیدا ئەویان بردە سەربانی کۆشکەکە و سەریان بڕی و جەستەکەیان فڕێدایە خوار. موسلیم بەمحەممەد کوڕی ئەشعەسی وت: سوێند بەخوا ئەگەر ئەمانەکەی تۆ نەدەبو، خۆم تەسلیمی ئەوان نەدەکرد، هەستە و بەشمشێرەکەت پارێزگاری لەمن بکە چونکە پەیمانەکەت خستە ژێرپێ. موسلیمان بۆ سەربانی کۆشکەکە دەبرد و ئەو بەردەوام داوای بەخشینی دەکرد و سوپاس و وەسفی خوای دەکرد. ئەویان بردە سەر شوێنێك بەناوی (حدایین) و سەرپیان پەڕاند. ئەو کەسەی ئەوی کوشت، بوکیر کوڕی حیمران بو کە موسلیم بەشمشێر لێیدابو. دواتر لاشەکەیان بەدوای سەریدا فڕێدایە خوار.

کاتێك بوکیر گەڕایەوە، کوڕی زیاد پرسی: کاتێك ئەوتان بۆ سەرەوە دەبرد، چی دەوت؟ وتی: داوای لێخۆشبونی دەکرد و بەردەوام وەسف و سوپاسی خوای دەکرد. کاتێك بۆ کوشتن نزیك کردمەوە، وتم: سوپاس بۆ خوا کەدەستی منی بۆ سەر تۆ ئاوەڵا کرد تا بتوانم ڕقی خۆم دامرکێنمەوە. بەشمشێر لێمدا بەڵام نەیکوشت. موسلیم وتی: ئەی

کۆیلەی پەست، ئایا ئەو برینەی دروستت کرد، بەئەندازەی ئەو برینە نیە کە پێت براوە؟ کوڕی زیاد وتی: شانازی کردن بەخۆ تەنانەت لەکاتی گیانداندا! وتی: دواتربۆ جاری دوەم بەشمشێر لێمدا و کوشتم.

محەممەد کوڕی ئەشعەس هەستا و سەبارەت بە هانی لەگەڵ کوڕی زیاد قسەی کرد و پێی وت: پێگە و بنەماڵەی ئەو لەم شارەدا دەناسیت. خەڵکەکەی دەزانن من و هاورێکەم ئەومان بۆ ئێرە هێنا. سوێندت دەدەم بەخوا ئەو بەمن ببەخشیت چونکە من لەدوژمنی خەڵکەکەی دەترسم. کوڕی زیاد مژدەی ئەو کارەی پێدا بەڵام کاتێك کێشەی موسلیم بەرز بویەوە، لەوتارەکەی خۆی سەبارەت بەهانی پاشگەز بویەوە و کاتێك موسلیم کوژرا، فەرمانیدا هانیشیان بردە بازار و کوشتیان. کۆیلەیەکی تورك لەکۆیلەکانی کوڕی زیاد ئەوی کوشت. دەڵێت: دواتر عەبدولرەحمان کوڕی حوصەینی مورادی ئەوی لەخارز لەگەڵ کوڕی زیاد بینی و کوشتی. عەبداللە کوڕی زوبەیری ئەسەدی سەبارەت بەکوژانی هانی و موسلیم شێعری هۆنیەوە. دەستەیەك دەڵێن: فەرەزدەقی وتاردەر بو کەوتی:

| | |
|---|---|
| فان کنت لا تدرین ما الموت فانظری | الی هانیء فی السوق و ابن عقیل |
| الی بطل قد هشم السیف وجهه | و اخر یهوی من طمار قتیل |

یانی: ئەگەر نازانیت مەرگ چیە، سەیری هانی بکە لەبازار و سەیری کوڕی عەقیل بکە. سەیری پاڵەوانێك بکە کەشمشێر روخساری قەڵشاند و سەیری ئەویتریان بکە لەسەر بانی کۆشك سەریان پەڕاند و فڕیاندایە خوار.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی دوورودرێژە.

کوڕی زیاد سەری هەردوکیانی بۆ لای یەزید رەوانە کرد. یەزید نامەی بۆ نوسی و سوپاسی کرد و پێی وت: بیستومە حسین روی لەعێراق کردوە. پاسگا و پایگاکان بەهێز بکە و لەسەر بنەمای تۆمەت زیندانی بکە و لەسەر بنەمای گومان دەستگیر بکە بەڵام جگە لەو کەسانەی شەڕ لەگەڵ تۆ دەست پێدەکەن، کەس مەکوژە.

دەڵێن: هاتنی عەقیل لەرۆژی هەشتەم یا نۆیەمی زی حەججەی ساڵی شەست / ٩ یا ١٠ سێپتامبەری ٦٨٠ زایینی بو. دەڵێن: ئەو کەسانەی هاورێ لەگەڵ عەقیل هاتن، موختار کوڕی ئەبی عوبەید و عەبداللە کوڕی حارس کوڕی نەوفل بون. زیاد بەدوای ئەم دوانەدا گەڕا و هەردوکیانی خستە زیندانەوە. لەناو ئەو کەسانەی لەگەڵ موسلیم شەڕیان کرد، محەممەد کوڕی ئەشعەس و شبس ڕێبعی تەمیمی و قەعقاع کوڕی شومر دەبینران. شبس بەردەوام دەیوت: تا کاتی شەو چاوەڕێ بن تا ئەمانە بڵاوەی لێبکەن.

قەعقاع وتی: تۆ ڕێگەی هەڵاتنت لەسەر ئەوان بەستوە، ڕێگەیان پێ بدە تا خۆیان بلاَوەی لێ بکەن.

## ڕەوانە بونی حسین بەرەو کوفە

دەڵێن: کاتێك حسین بڕیاریدا لەسەر بنەمای نامەی خەڵکانی عێراق بەرەو کوفە بڕوات، عومەر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هشام لەمەککە ڕۆشتە لای ئەو و وتی: بۆ کارێك هاتومە لای تۆ و لەسەر بنەمای چاکەخوازی تۆ دەمەوێت باسی بکەم. ئەگەر گومانی چاکەخوازی لەمن دەکەیت، باسی دەکەم و ئەوی لەسەر شانمە لەراستی و دروستی بەجێی دێنم. ئەگەر گومانی چاکەخوازی لە من ناکەیت، لەمەبەستەکەم چاو دەپۆشم. حسین پێی وت: بڵێ چونکە سوێند بەخوا هیچ کات تۆم بەم فێڵباز نەزانیوە و پاڵنەرێك لەخواستە نارەوەکان لەتۆدا نابینم. عومەر پێی وت: بیستومە دەتەوێت بۆ عێراق بڕۆیت و ئەمە ئەو شتەیە من نیگەران دەکات. تۆ دەڕۆیتە شارێك کەفەرماندار و کارگوزارانی هەیە و گەنجینەکان لەدەستی ئەواندایە. خەڵك کۆیلەی ئەم جیهانە و زێر و زیون. من دڵنیام ئەو کەسانە شەڕ لەگەڵ تۆ دەکەن کەمژدەی هاوکاریان پێ داویت، ئەو کەسانەی تۆیان لەو کەسەی بەهاوکاری ئەوان شەڕی لەگەڵ دەکەیت، زیاتر خۆش دەوێت. حسین پێی وت: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەی کوڕە مامی بەڕێز. زانیم تۆ لەسەر بنەمای چاکەخوازی ئەمانە بەمن دەڵێیت و بیرمەندانە قسە دەهێنیتە سەر زمان. هەر کارێك چارەنوس بێت، بەناچار دەبێت ئەنجام بدرێت. بەلاَم چ گرنگی بەوتەکەی تۆ بدەم و چ پشت گوێی بخەم تۆ بۆ من باشترین ڕاوێژکار و چاکترین چاکەخوازیت.

دەڵێت: عەبدالله کوڕی عەباس هاتە لای و پێی وت: خەڵك دەڵێن مەبەستی ئەوەت هەیە بڕۆیتە عێراق، بۆم ڕون بکەرەوە چ مەبەستێکت هەیە؟ حسین وتی: بەخواستی خوای گەورە، ئەمڕۆ یا بەیانی بەڕێدەکەوم. کوڕی عەباس پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا ئەو کارە نەکەیت. خوا لێت خۆش بێت، پێم بڵێ، ئایا دەڕۆیتە شارێك خەڵکەکەی فەرماندارەکەی خۆیان کوشتوە و دەستیان بەسەر وڵاتەکەی خۆیان گرتوە و دوژمنەکانیان تا شوێنێکی دور دەرپەڕاندوە؟ ئەگەر ئەم کارەیان کردوە، بڕۆ. بەلاَم ئەگەر تەنیا تۆیان بانگ کردوە و فەرماندارەکەیان هێشتا زیندوە و کارگوزارانی ئەو باج و سەرانە لەخەڵك وەردەگرن، تۆیان بۆ زیان و جەنگ بانگ کردوە و من ئاسودە نیم کە

فریوت بدەن و بەدرۆزن ناوت بەرن و ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ تۆبگرنە بەر و هاوکاریت نەکەن و لەشەڕ کردن دژی تۆ پەلە بکەن و دواتر بێ بەزەییترینی خەڵکان بن لەسەر تۆ. حسین وتی: سەرەتا داوای چاکە لەخوا دەکەم تا بزانم دواتر دەبێت چی بکەم.

کوڕی عەباس ڕۆشت و دواتر کوڕی زوبەیر هات و ماوەیەك گفتوگۆی لەگەڵ کرد و وتی: ئێمە منالی موهاجیرەکان و خواوەندانی کار پێش ئەم فەرمانڕەوایانەین، بۆ دەبێت ڕێگەیان لێنەگرین و دەستیان لێ هەڵبگرین؟ ئاگادارم بکەرەوە دەتەوێت چی بکەیت؟ حسین وتی: بیرم کردۆتەوە و مەبەستی ئەوم کردوە بڕۆمە کوفە. شوێنکەوتەکانی من و گەورەی خەڵکان نامەیان بۆ نوسیوم و من چاوەڕوانی چاکە لەخوا دەکەم. عەبداللە کوڕی زوبەیر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر شوێنکەوتەی وەك تۆم دەبو، چاوم لەم کارە نەدەپۆشی. دواتر ترسی ئەوەی لێ نیشت حسین کوڕی عەلی مەبەستێکی تری هەبێت یانی عەبداللە کوڕی زوبەیر بڕوات تا بارودۆخ بۆ خۆی ئامادە بێت. لەبەر ئەمە وتی: ئاگاداربە ئەگەر لەحیجاز بمێنیتەوە و داوای فەرمانڕەوایی لێرە بکەیت، ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ تۆ ناگرمەبەر بەڵکو هاوکاری و بەیعەتت لەگەڵ دەبەستم وچاکەخوازی تۆ دەبم. حسین وتی: باوکم ئاگاداری کردومەتەوە کە لەمەککە مەڕێکی قوربانی سەر بەرز دەکاتەوە کە لەزیانی ئەو پاسەوانی کردنی ماڵی خوا لەناو دەچێت و من نامەوێت ئەو مەڕە بم. دواتر ئەو دوانە (حسین و کوڕی زوبەیر) گفتوگۆکانیان لەئێمە شاردەوە. حسین روی کردە ئەو کەسانەی لەوێ ئامادە بون و وتی: دەزانن چی دەڵێت؟ وتیان: نازانین چی دەڵێت؟ حسین وتی: دەڵێت: لەم مزگەوتەدا بمێنەرەوە کە من خەڵك لەدەوری تۆ کۆدەکەمەوە. دواتر حسین پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر یەك بست لەدوری ماڵی خوا بکوژرێم بەباشتری دەزانم لەوەی یەك بست نزیکتر لەماڵی خوا بکوژرێم. سوێند بەخوا ئەگەر لەکونی یەکێك لە بونەوەرەکانی ئەم دەشتە بم، بێ چەند و چون دەمکێشنەدەر تا نیازی خۆیان بەمن هێننەدی! بەهەمان شێوە کە جولەکەکان لەشەوی شەممە بوێریان لەخۆیان نیشاندا، ئەوانیش لەسەر من بوێر دەبن. کوڕی زوبەیر هەستا و بەجێی هێشت.

حسین وتی: بۆ ئەم پیاوە لەم جیهانە هیچ شتێك خۆشەویستتر لەوە نیە کە من لەحیجاز دەڕۆم. ئەو دەزانێت بەبونی من، خەڵك لەدەوری ئەو کۆنابنەوە. لەبەر ئەمە دەیەوێت من بڕۆم تا گۆڕەپان بۆ ئەو خاڵی ببێت.

دەڵێت: کاتێك ئێواریّ یا بەیانی بەیانی گەیشت، کوڕی عەباس ڕۆشتە لای حسین و وتی:

ئەی کوڕە مام، من خۆڕاگر خۆم نیشان دەدەم بەڵام خۆڕاگرنیم. لە لەناوچونی تۆ دەترسم و چاوەڕوانی ئەو بەڵایە دەکەم. عێراقیەکان خەڵکانێکی سست باوەڕ و ناسوپاسن، خۆت لەوان نزیك مەکەرەوە. لەم شارەدا بمێنەرەوە چونکە گەورەی خەڵکانی حیجازیت. ئەگەر عێراقیەکان بەهەمان شێوە کەگومانیان کردوە، خوازیاری تۆن، نامەیان بۆ بنوسە تا فەرماندارەکەی خۆیان دەربکەن و دوژمنەکەیان دەرپەڕێنن تا تۆ دوای ئەم کارە بڕۆیت. ئەگەر بێ گومان دەتەوێت بڕۆیت، برۆ بۆ یەمەن چونکە قەڵای بەهێزی لێیە و یەمەن خۆی سەرزەمینێکی پان وبەرینە و باوکی تۆ لەوێ شوێنکەوتەی هەیە و تۆ لەخەڵکان بەدور دەبیت. بۆ خەڵك نامە دەنوسیت و نێردراوەکانی خۆت رەوانە دەکەیت و هیوادارم بەمشێوەیە لەتەندروستیدا ژیان بەسەر ببەیت.

حسین پێی وت: ئەی کوڕە مام، سوێند بەخوا دەزانم تۆ چاکەخواز و مێهرەبانی. لەگەڵ ئەمەیشدا بڕیاری ئەوەمداوە بڕۆم و بۆچونم ئەومیە بەرێکەوم. کوڕی عەباس پێی وت: ئەگەر دەتەوێت بڕۆیت، ژن و منداڵەکانت لەگەڵ خۆت مەبە چونکە دەترسم تۆ بکوژرێیت بەهەمان شێوە کەعوسمان کوژرا و ژن و منداڵەکانی سەیریان دەکرد. دواتر کوڕی عەباس پێی وت: چاوی کوڕی زوبەیرت بەڕۆشتن لەحیجاز رون کردەوە چونکە ئەمڕۆ کە تۆ لێرەیت کەس ئاوڕ لەو ناداتەوە. سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نیە، ئەگەر دەمزانی دەتوانم قژ و سەرت بەبەهێزی رابگرم تا خەڵك لەدەوری ئێمە کۆببنەوە و تۆ گوێ لەوتارەکانی من بگریت و لێرە بمێنیتەوە، ئەو کارەم دەکرد.

دواتر عەبداللە کوڕی عەباس ڕۆشت و لای عەبداللە کوڕی زوبەیر تێپەڕی کرد و وتی: کوڕی زوبەیر، چاوت رون! دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| یا لك من قبرة بمعمر | خلالك الجو فبیضی و اصفری |

ونقری ماشئت ان تنقری

یانی: چ بەختەوەر مەلێك لەمێرگەلانێکی خۆش بەئاو و دانی فراوان! ئاسمانی بەتۆ سپارد و بەرێکەوت، کەواتە هێلکە بکە و ئاواز بخوێنە و تا ئەو جێگەی دەتوانی ئاوازەکەت بەچریکە بەرز بکەرەوە.

دەستەیەك دەڵێن: حسین ئەو رۆژانە بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا دەست لەمن هەڵناگرن تا خوێن لەدەمارەکانم دەکێشنەدەر. ئەگەر ئەم کارە بکەن، خوا کەسێك دەکاتە فەرمانڕەوای ئەوان کە ریسوا و سوکیان دەکات بەهەمان شێوە کە( شەرمی ژن) ریسواتر ببن.

حسین لەرۆژی (ناوگیران) هەشتی زی حەججە / ٩ سێپتامبەری ٦٨٠ زایینی، رۆژی کوژرانی موسلیم کوری عەقیل، بەرێکەوت. نێردراوانی عەمرۆ کوری سەعید کوری عاص فەرمانداری حیجاز لەلایەن یەزید کوری معاویە (یا براکەی یەحیا کوری سەعید) رێگەیان لێگرت تا رێگر بن لەرۆشتنی ئەو. حسین گرنگی پێنەدان و بەرێگەی خۆیدا رۆشت. هەردولا بەقامچی پەلاماری یەکیان دا. حسین و هاورێکانی خۆراگریان کرد و درێژەیان بەرێگەکەیان داتا لە(تەنعیم) تیپەرین. حسین لەوێ کاروانێکی بینی کەبەحیر کوری رەیسان (رەیان) فەرماندارى یەزید لەیەمەن بۆ ئەوی رەوانە کردبو و تیایدا (وەرس، دارێکی بیابانی و کشتوکاڵی کەهەویرێکی سوررەنگی بۆ رەنگ رێژی لێ دەردەهێنرێت) و زێر و زیوی فراوان دەبینرا. حسین ئەوانی هەڵگرت و بەخاوەنی وشترەکانی فەرمو: هەر کەس لە ئێوە بیەوێت لەگەڵ ئێمە تا عێراق بێت، کرێکەی بێ کەم و کوری تا ئەوێ دەدەین و رێز لەهاورێیەتیەکەی دەگرین. هەر کەس بیەوێت لێرەدا لێمان جیا ببێتەوە کرێی تا ئێرەی پێدەدەین. ئەو کەسانەی جیابونەوە، کرێی خۆیان هەڵگرت و ئەو کەسانەی تا کەربەلا لەگەڵی رۆشتن کرێی خۆیان تا ئەوێ وەرگرت لەگەڵ جل و بەرگی گرانبایی فراوان.

دواتر بەرێکەوت تا گەیشتە صیفاح. لەوێ فەرەزدقی وتاردەر چاوی پێیکەوت وپێی وت: خوا ئارەزوەکانت بەتۆ ببەخشێت و خواستەکانت بەشێوەی دڵخواز بێنێتەدی. حسین پرسی: خەڵك لەپشتی سەری خۆت چۆن بینی؟ فەرزەدەق وتی: لەکەسێکی ئاگا و بە ئەزمونت پرسی: دڵی خەڵك لەگەڵ تۆیە و شمشێریان لەگەڵ ئومەوییەکان. چارەنوس لەئاسمانەوە دێت و خوار هەر کارێکی بوێت، ئەنجامی دەدات. حسین وتی: راستت وت، کارەکان لەدەست خوایە، هەرچی بوێت ئەنجامی دەدات و خوای ئێمە هەر رۆژە و فەرمانێکی هەیە. ئەگەر چارەنوس لەسەر بنەمای خواستەکانی ئێمە بێت، خوا بۆ بەخشینەکانی سوپاس دەکەین چونکە هەر خۆی هێزی سوپاس کردنمان پێ دەبەخشێت. ئەگەر چارەنوس رێگەی هیوامان لێ بگرێت، ستەمکار نیە ئەو کەسەی لەسەر رێگەی راست و دروستی و شێوازی خۆپارێزی و خواپەرستیە.

لەم کاتەدا نامەی عەبداللە کوری جەعفەر هاورێ لەگەڵ دو کورەکەی عەون کوری عەبداللە و محەممەد کوری عە بەدەستی حسین گەیشت. نامەکە بەم شێوە بو: دوای سڵاو، سوێندت دەدەم بەخوا کاتێك نامەکەی من دەخوێنیتەوە، دەست بەجێ بگەرێیتەوە چونکە لەورێگەی گرتوتەبەر، دەترسم لەناو بچیت و لەناوچونی تەواوی

بنەماڵەکەتی بەدواوە بێت. ئەگەر تۆ لەناو بچیت، روناکی سەر زەوی رو لەکوژانەوە دەکات چونکە تۆ ئاڵای ئەو کەسانەیت کە بەدوای رێگەی راستتدا دەگەرێن و هیوای باوەرِدارانیت. لەرۆشتن پەلە مەکە چونکە خۆم بەدوای نامەکەم دێم. سلاّو و ماڵئاوا.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدالله کوڕی جەعفەر رۆشتە ری عەمرۆ کوڕی سەعید و وتی: نامەیەك بۆ حسین بنوسە و ئەمانی پێ ببەخشە و هیواداری بکە کە چاکەی لەگەڵ دەکەیت و رێز لەپەیوەندی خزمایەتی دەگریت. داوای لێ بکە تا بگەڕێتەوە. عەمرۆ کارگوزاری یەزید لەمەککە بو. عەمرۆ ئەو کارەی کرد و نامەکەی نوسی و بەبراکەی خۆی یەحیا کوڕی سەعید و عەبدالله کوڕی جەعفەر رەوانەی کرد. ئەو دوانە خۆیان گەیاندە حسین و نامەکەیان بۆ خوێندەوە و هەوڵیاندا بیگەڕێننەوە بەلاّم بەدوای ئەو دوانەیش رازی نەبو. لەو بەڵگانەی حسین ئاماژەی پێدەدان، ئەوەبو کەدەیوت: پێغەمبەری خوام لەخەودا بینیوە و فەرمانێکم لێوەرگرتوە و بەدوای ئەو فەرمانەدا دەرِۆم. بۆ من شیاوتر دەبو. ئەو دوانە وتیان: ئەو خەوە چیە؟ حسین وتی: بۆ هیچ کەسی ناگێڕمەوە و تا ئەو رۆژەی زیندوم نایگێڕمەوە.

کاتێك هەواڵی بەرێکەوتنی حسین لەمەککە بە کوڕی زیاد گەیشت، حوصەین کوڕی نەمیری تەمیمی سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە کرد. ئەو رۆشت و لەقادسیە دابەزی و سوارەکانی لەنێوان قادسیە تا خەففان و لەنێوان قادسیە تا قوتقوتانە تا کوێستانەکانی لەعلەع بۆ پاسەوانی کردن جێگیر کرد. کاتێك حسین گەیشتە حاجر، نامەیەکی بۆ خەڵکانی کوفە نوسی و هاورێ لەگەڵ قەیس کوڕی موسهێر صەیداوی رەوانەی کرد و ئاگاداری کردنەوە بەرەو لای ئەوان بەرێکەوتوە. و فەرمانی پێدان بۆ کارەکەی خۆیان شەرِ دەست پێبکەن. کاتێك قەیس گەیشتە قادسیە، حوصەین ئەوی گرت و رەوانەی لای کوڕی زیادی کرد. کوڕی زیاد پێی وت: دەبێت برۆیتە سەر بانی کۆشك و جوێن بە درۆزن و لەدرۆزن بو یانی حسین کوڕی عەلی بدەیت. قەیس رۆشتە سەربانی کۆشك و سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: ئەمە حسین کوڕی عەلی باشترین پیاو لەناو ئافرێنراوەکانی خوایە و کوڕی فاتیمە کچی پێغەمبەری خوایە و من نێردراوی ئەوم کە ئەوم لەحاجر بەجێهێشت. وەلاّمی بدەنەوە و هاوکاری بکەن. دواتر جوێن بەکوڕی زیاد و باوکیدا و داوای لێخۆشبونی بۆ عەلی کرد. کوڕی زیاد فەرمانیدا و ئەویان لەسەر بانی کۆشکەوە فرێدایە خوار کە جەستەی لەت لەت و گیانی تەسلیم کرد.

دواتر حسین بەرەو کوفە بەرێکەوت و گەیشتە ئاوێك لەناوی عەرەبەکان و بینی

عەبدالله کوڕی موتیع لەوێیە. کاتێك ئەوی بینی، هەستا و وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن ئەی کوڕی کچی پێغەمبەری خوا، بۆ هاتویت بۆ ئێرە؟ ئەو حسینی دابەزاند و ڕێزی لێگرت. حسین لەهەواڵی کارەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە. عەبدالله پێی وت: خوات بیردێنمەوە ئەی کوڕی پێغەمبەر تا ڕێگە نەدەیت ئیسلام بەرەو لەناوچون بڕوات، تۆ بەخوا سوێند دەدەم. سوێند بەخوا ئەگەر داوای ئەوە بکەیت کە لەدەست ئومەوییەکاندایە، بێ چەند و چون دەتکوژن و ئەگەر تۆ بکوژن، دوای تۆ ڕێزی هیچ کەسێك ناگرن. سوێند بەخوا ئەمە ڕێزی ئیسلامە، نامێنێت، ڕێزی قورەیش و ڕێزی عەرەبەکانە. ئەم کارە مەکە و مەڕۆ بۆ کوفە و خۆت گیرۆدەی ئومەوییەکان مەکە!
حسین جگە لەڕۆشتن بەهیچیتر ڕازی نەبو.

لەو ڕۆژانەدا زوهەیر کوڕی قەینی بەجلی حەجی کردبو. ئەو لایەنگری عوسمان. خوازراو یا نەخوازراو کەوتە سەر ڕێگەکەی حسین. ئەو لەمەککەوە لەگەڵ حسین ڕێگەی بڕی بەلأم لەیەك شوێن لەگەڵ ئەو دانەدەبەزی. ڕۆژێك حسین بانگی کرد و ئەم کارە بۆ زوهەیر گران بەلأم ناچار ڕۆشتە لای ئەو. کاتێك گەڕایەوە ڕوخساری وەك گوڵ گەشابویەوە و هاوشێوەی خۆر دەدرەوشایەوە. باروبنەکەی بۆ لای باروبنەی حسین برد و بەهاوڕێکانی وت: هەرکەس منی دەوێت، هاوڕێیەتیم بکات و گەرنە ئەمە دوایین دیدارە. ئێستا گێڕانەوەیەك بۆ ئێوە دەگێڕمەوە: ئێمە لەناوچەی بەلەنجەر لەڕێگەی خوادا شەڕمان کرد وسەرکەوتین و تالأنی زۆرمان بەدەست هێنا و شادمان گەڕاینەوە. سەلمانی پارسی لەگەڵ ئێمەدابو. پێی وتین: کاتێك ڕوبەڕوی سەروەری گەنجەکانی بەهەشت بونەوە، لەشەڕ کردن شان بەشانی ئەو شادمانتر لەبەدەست هێنانی تالأنیەکانی ئەمڕۆتان دەبن. من، ماڵئاوایی لەئێوە دەکەم و بەخواتان دەسپێرم. دواتر ژنەکەی ئازاد کرد و وتی: بۆ لای بنەماڵەکەت بگەڕێرەوە چونکە نامەوێت لەمنەوە جگە لەچاکە بەتۆ بگات. ئەو هاوڕێیەتی حسینی هەڵبژارد و لەگەڵ ئەودا کوژرا.

هەواڵی کوژرانی موسلیم کوڕی عەقیل لەسەعلەبیە بەحسین گەیشت. یەکێك لەهاوڕێکانی وتی: سوێندت دەدەین لێرەوە بگەڕێیتەوە چونکە تۆ لەکوفە هیچ یار و هاوکارێکت نیە. ئێمە دەترسین کوفیەکان دژی تۆبن. کوڕانی عەقیل هەستان و وتیان: سوێند بەخوا لەتۆ جیانابینەوە تا تۆڵەی خۆمان لەبکوژەکانی باوکمان وەردەگرین یا ئەوەمان پێدەبڕێت کە بەموسلیم بڕا. حسین وتی: ژیان دوای ئەم ڕێزدارانە هیچ سودێکی نیە. یەکێك لەهاوڕێکانی پێی وت: تۆ وەك موسلیم کوڕی عەقیل نیت و ئەگەر

بڕۆیتە ناو کوفە، خەڵك بەپەلە بۆ هاوکاری تۆ دێن. ئەوان سوار بون و ڕێگەیان بڕی تا گەیشتنە زوبالە. دەگەیشتە هەر ئاوێك، هەمو کەسانی ئەو ناوچەیە پەیوەستی دەبون. تا گەیشتن بەزوبالە بەمشێوە بو. لێرەدا هەواڵی کوژرانی برای شیری خۆی عەبدالله کوڕی بوقتەری پێگەیشت. ئەوی لەرێگاوە بەدوای موسلیم کوڕی عەقیلدا ڕەوانە کردبو چونکە نەیدەزانی ئەو کوژراوە. سوارەکانی حوصەین کوڕی نەمیر ئەویان دەستگیر کرد و حوصەین ئەوی بۆ لای کوڕی زیاد ڕەوانە کرد. کوڕی زیاد پێی وت: دەبێت بڕۆیتە سەربان و جوێن بەو درۆزنە درۆزن زادە بدەیت و بگەڕێیتەوە تا بۆچونی تۆ سەبارەت بەخۆم بزانم. ئەو ڕۆشت و خەڵکی لەهاتنی حسین ئاگادار کردەوە و جوێنی بەکوڕی زیاد و باوکیدا. کوڕی زیاد ئەویشی فڕێدایە خوار کەمێسقانەکانی شکا بەلأم نیوەگیانێك لەجەستەیدا مایەوە. پیاوێك بەناوی عەبدولەلیك کوڕی عومەیری لەخمی هات و سەری بڕی. کاتێك ئەویان سەرکۆنە کرد، وتی: ویستم ڕزگاری بکەم.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی سەری بڕی عەبدولەلیك نەبو بەڵکو پیاوێکی هاوشێوەی ئەو بو.

کاتێك هەواڵی کوژرانی برای شیری حسین و موسلیم کوڕی عەقیل بەحسین گەیشت، خەڵکی لێ ئاگادار کردەوە و وتی: لایەنگرانی ئێمە دەستیان لەهاوکاری کردنی ئێمە هەڵگرتوە، هەرکەس دەیەوێت لەهاوڕێیەتی ئێمە پاشگەز ببێتەوە، بگەڕێتەوە چونکە پەیمانی کەسمان لەئەستۆدا نیە. ئەوان بۆ چەپ و ڕاست بڵاوەیان لێکرد و تەنیا ئەو کەسانەی لەمەککەوە لەگەڵ ئەودا بون، مانەوە. لەبەر ئەوە ئەو کارەی کرد چونکە دەیزانی عەرەبەکان گومان دەکەن ئەو دەڕواتە شارێکی دەستەمۆ و شوێنکەوتەی خۆی، دەیویست بزانێت چ مەبەستێکیان هەیە.

دواتر بەرێکەوت تا گەیشتە بەنی عەقەبە. چاوی بەپیاوێکی تازە کەوت و پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا بگەڕێیتەوە چونکە بێ گومان ڕوبەڕوی ڕم و شمشێرەکان دەبیتەوە. ئەوانەی نامەیان بۆ تۆدەنارد، ئەگەر قورسایی شەڕیان لەسەر شانی تۆ هەڵدەگرت و بارودۆخیان بۆ تۆ ئامادە دەکرد و دواتر تۆ دەڕۆشتیتە لای ئەوان، کارێکی بەهێز و دڵگیر بو. بەلأم ئێستا ئەوەی ئاماژەی پێدەدەی، پەسەندی ناکەم کەدەبێت بەکۆتایی بگەیێنیت. حسین وتی: ئەوەی باست کرد، لای من شاراوە نیە، بەلأم ناتوانین چارەنوسی خوایی و فەرمانی خوای گەورە بگەڕێنینەوە. دواتر لەوێ کۆچی کرد.

## بیر کردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاص ئەشدەق، فەرمانڕەوای مەدینە و مەککە لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن، دەستەیەکیان لەم ساڵەدا و دەستەیەکیان لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی معاویە کوڕی ئەبو سوفیان لەساڵە جۆراوجۆرەکان کەئێستا ئاماژەیان پێدەدرێت: جەرهەد ئەسلەمی لەهاوەڵانی پێغەمبەر، حارسە کوڕی نەعمانی ئەنساری لەبەدریەکان، لەسەردەمی معاویە، دحیە کوڕی خەلیفە کەلبی کە هاوشێوەی جبەرئیل بو و ئەمە لەکاتێکدا کە بۆ هێنانی وەحی دەهاتە سەر زەوی، لەسەردەمی معاویە، رفاعە کوڕی رافع کوڕی مالك کوڕی عەجلان ئەنساری لەبەدریەکان و هاورێیانی عەلی لەشەڕی وشتر و سەفین کە لەسەرەتای خەلافەتی معاویە مرد، عەمرۆ کوڕی ئومەییە زەمری لەمەدینە، لەسەردەمی معاویە، عوسمان کوڕی حەنیفی ئەنساری، عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاصی سەقەفی، عێتبان کوڕی مالکی ئەنساری لەبەدریەکان، لەرۆژگاری معاویە، سەهل کوڕی حەنزەلیە کوڕی رەبیعی ئەنساری، لەزەمانی معاویە و لەدیمەشق، سوراقە کوڕی عەمرۆ ئەنساری لەبەدریەکان، لەسەرەتای کاری معاویە، مەعقەل کوڕی یەساری موزنی لەرۆژگاری معاویە، ئەو کەسەی ناوی روباری مەعقەل لەبەسرە بەناوی ئەو ناونراوە و دەستەیەك وتویانە: لەرۆژگاری یەزید مرد. ناجیە کوڕی جوندەب کوڕی عومەیر شوانی مەڕومالآتی پێغەمبەر لەسەردەمی خەلافەتی معاویە، نوعیمان کوڕی عەمرۆ کوڕی رافیعەی ئەنساری لەبەدریەکان کە پیاوێکی گاڵتەچی بو و دەستەیەك وتویانە، ئەو کەسەی مرد، کوڕەکەی بو. عەبدالله کوڕی مالك کوڕی بوحەینە لەئەنسار، لەکۆتایی فەرمانڕەوایی معاویە، عەبدالله کوڕی موغەفەل کوڕی عەبد غونەمی موزنی لەبەسرە، هند کوڕی جاریە کوڕی هندی ئەسلەمی، لەرۆژگاری معاویە، حەکیم کوڕی حزام لەسەد و بیست ساڵی و لەم ساڵەدا. شەست ساڵ لەرۆژگاری جاهلی و شەست لەرۆژگاری ئیسلامیدا، ئەبو ئەسیدی ساعیدی کە ناوی مالك کوڕی رەبیعە بو و لەبەدریەکان و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٥/٦٨٥ زایینی مرد. دوایین کەسی بەشدار لەشەڕی بەدر کە دەستەیەك مەرگی ئەویان بۆ ساڵی ٣٠ / ٦٥٠ زایینی گەڕاندۆتەوە و راست نیە، ئەبو بوردە هانی کوڕی نیاری بەلەوی هاوپەیمانی ئەنسار لەعەقەبیەکان و بەدریەکان کە لەهەمو شەڕەکان هاوکاری عەلی کرد، لەرۆژگاری

معاویە، ئەبو سەعلەبە خوشەنی لەئەنسار لەرۆژگاری معاویە کەدەستەیەك مەرگی ئەویان بۆ ساڵی ٦٩٤/٧٥ زایینی گەڕاندۆتەوە. ئەبوجەهم کوڕی حەزیفەی عەدەوی قورەشی لەکۆتایی ئەم ساڵە کە دەستەیەك دەڵێن: تا کاتی ئاوەدان کردنەوەی کەعبە لەرۆژگاری عەبدالله کوڕی زوبەیر زیندو و لەسەردەمی چاك کردنەوەی کەعبەر لەسەر دەستی قورەیشیەکانیش ئامادە بو. ئەبو حەسەمەی ئەنساری باوکی سەها لەیەکەم رۆژەکانی خەلافەتی معاویە، ئەبو قەیسی جوهەنی لەئامادەبوان لەگرتنی مەککە، لەرۆژەکانی کۆتایی خەلافەتی معاویە، صەفوان کوڕی موعەتەلی سولەمی لەسومەیسات کە وتویانە پێش لەم ساڵە لەرێگەی خوادا کوژرا. ژنێك لەهۆزی کەلاب کە توبەهاوسەری پێغەمبەر و کاتێك پێغەمبەر ویستی لەئامێزی بگرێت وتی: پەنا بەرخوا، پێغەمبەر و ئەم کارانە! پێغەمبەر لێی جیا بویەوە و ئەو شێت بو. بیلال کوڕی حارسی موزنی، ئەبو عەبدولرەحمان، وایل کوڕی حەجری حەزرەمی لەکۆتاییەکانی خەلافەتی معاویە، ئەبو ئیدریسی خەولانی.

## روداوەکانی ساڵی شەست ویەکی کۆچی (٦٨٠- ٦٨١ زایینی)

## کوژرانی حسین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب

حسین کوڕی عەلی تا بەرەو شەراف بۆ پێشەوە ڕۆیشت. کاتێك ڕۆژ گەیشتە نیوە، یەکێك لەهاوڕێکانی تەکبیری وت. لێی پرسی: بۆ تەکبیرت وت؟ وتی: دارخورماکان دەبینم. دوپیاو لەبەنی ئەسەد پێیان وت: لەم دەشتەدا دار خورمای لێ نیە! حسین وتی: کەواتە چیە؟. ئەو دوانە وتیان: جگە لەگەردنی ئەسپەکان و سەری ڕمەکان هیچ شتێك نابینین. حسین وتی: منیش ئەو گومانەم هەیە. حسین بەو دوانەی وت: ئایا لەم دەوروبەرە هیچ پەناگەیەکی لێ نیە، پەنای بۆ ببەین کە لەپشت سەرمانەوە بێت تا لەیەك قۆڵەوە روبەروی ئەم خەڵکە ببینەوە؟ وتیان: لێیەتی: ئەم زوحوسومە لای تۆیە، لەچەپەوە بۆی دەڕۆیت و ئەگەر لەپێش ئەوانەوە بگەیت، ئەوەیە کە دەتەوێت. ئەو بەرەو ئەو ناوچەیە ڕۆشت و زۆری نەخایاند سوارەکان گەیشتن و ڕێگەی خۆیان بۆلای ئەوان گۆڕی. حسین زوتر لەوان گەیشتە کوێستان و لەوێ دابەزی. ئەوان گەیشتن. هەزار سوارە بەسەرکردایەتی حوڕ کوڕی یەزیدی تەمیمی یەربوعی. لەگەرمای پروکێنەری نیمەڕۆ لەبەرابەر حسین دابەزین. حسین بەهاوڕێیان و گەنجەکانی خۆی وت: ئاویان بەخۆیان و ئەسپەکانیان بدەن. ئەو کارەیان کرد. ئەوان لەقادسیەوە دەهاتن. حوصەین کوڕی نومەیری تەمیمی ئەم هەزار پیاوەی بۆ روبەروبونەوەی حسین رەوانە کردبو. بەرهەمان شێوە روبەروی حسین کوڕی عەلی وەستابون تا کاتی نوێژی نیمەڕۆ گەیشت. حسین بەبانگدەرەکەی خۆی فەرمانیدا بانگ بڵێت. ئەو بانگی دا و خەڵکی بۆ نوێژ بانگ کرد. حسین هاتەدەر، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی:

ئەی خەڵکینە، ئەمە داوای لێبوردنێکە لەلای خواوەند و دوایین ئاگاداری بۆ ئێوە. من بۆ لای ئێوە نەهاتم تا ئەوەی لافاوی نامە و نێردراوەکانی ئێوە گەیشتە لای من و بەردەوام دەیانوت لەهاتن پەلە بکە چونکە ڕێبەرێکمان نیە و ئەگەری هەیە خوا لەروناکی تۆ بۆ ڕێگەی راست و دروست ڕێنوێنیمان بکات. ئێستا من هاتوم. ئەگەر پەیمانی بەهێز بەمن دەدەن، پشتی پێ ببەستم، دێمە ناو شارەکەی ئێوە. ئەگەر پەیمان نەدەن یا خوازیاری من نەبن، دەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوم.

ئەوان بێدەنگ بون و بەبانگدەرەکەیان وت: بۆ دوەم جار بانگ بدە.. بانگیدا. حسین بەحوڕی وت: ئایا دەتەوێت لەگەڵ هاورێکانت نوێژ بخوێنیت؟ حوڕ وتی: تۆ نوێژ بخوێنە تا ئێمە لەگەڵ تۆ نوێژ بخوێنین. حسین لەگەڵ هەموی ئەوان بۆ نوێژ وەستا. دواتر ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی خۆی و هاورێکانی لەدەوری کۆبونەوە و حوڕ گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. حسین کوڕی عەلی نوێژێکیتری خوێند و دوای نوێژ روی کردە ئەوان، سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی:

دوای سڵاو، ئەی خەڵکینە، ئەگەر لەخوا بترسن و راستی و دروستی بۆ خاوەنەکانی بگێڕنەوە، ئەم کارە زیاتر دەبێتە هۆی رەزامەندی خواوەند. ئێمە کە لەبنەماڵەی پێغەمبەرین، بۆ سەرپەرەستی کاروبارەکانی ئێوە شیاوترین. لەو کەسانە باشترین کە بەزۆر دەستیان گرتوە بەسەر ئەوەی خاوەنی نین و لەناو ئێوەدا بەستەم و بێدادگەری فەرمانڕەوایەتی دەکەن. ئەگەر ئێمە پەسەند ناکەن و مافەکانی ئێمە نازانن، و بۆچونتان جیاوازە لەوەی نێردراو و نامەکانتان ئاماژەیان پێدەدا، دەگەڕێمەوە.

حوڕ وتی: سوێند بەخوا نازانین، ئەم نێردراو و نامانەی باسی دەکەیت، کامانەن. حسین هەمو نامەکانی دەرهێنا و لەبەرابەر ئەوان خستیە سەر زەوی. حوڕ وتی: ئێمە لەو کەسانە نین کە نامەیان بۆ تۆ نوسیوە. فەرمانیان بەئێمەداوە کاتێك روبەروی تۆ دەبینەوە، لێت جیا نەبینەوە تا دەتبەینە لای کوڕی زیاد لەکوفە. حسین وتی: مەرگ لەم کارە بەتۆ نزیکترە! دواتر فەرمانی بەهاورێکانیدا کە سوار بون و گەڕانەوە. حوڕ رێگەی لێگرتن. حسین وتی: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، چیت دەوێت؟ حوڕ وتی: سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەتۆ هەر عەرەبێکیتر ئەم قسەی دەکرد، ناوی دایکیم دەهێنایە سەرزمان. هەر کەسێك لەهەر پلە و پێگەیەك! بەلام سوێند بەخوا هیچ چارەیەك جگە لە وەسف کردنی دایکی تۆ نیە. حسین وتی: چیت دەوێت؟ حوڕ وتی: دەمەوێت تۆ بۆ لای کوڕی زیاد ببەم. حسین وتی: سوێند بەخوا هاورێیەتی تۆ ناکەم. حوڕ وتی: سوێند بەخوا دەستت لێ هەڵناگرم. گفتوگۆ لەنێوان ئەوان درێژەی کێشا و بارودۆخ روی لەدژواری کرد. حوڕ وتی: فەرمانی شەڕ کردنم لەگەڵ تۆ پێ نیە بەڵکو دەمەوێت تۆ بۆ کوفە ببەم وتا ئەو کارە نەکەم لەتۆ جیا نابمەوە. ئێستا کە لەم کارە خۆت بەدور دەگریت، رێگەیەك هەڵبژێرە کە نە بەکوفە بگات و نە تۆ بۆ مەدینە بگەرێنێتەوە تا من

نامە بۆ کوڕی زیاد بنوسم و تۆ بۆ کوڕی زیاد یا یەزید نامە بنوسی ئەگەری هەیە خوا بارودۆخێك ئامادە بکات کە تەندروستی من تیا بێت تا دەربارەی تۆ گرفتاری هیچ شتێك نەبم. حسن لەرێگەی عوزیب و قادسیە بۆ لای راست ڕۆشت و حوڕ هەنگاو بەهەنگاوی ئەو رێگەی دەبڕی.

دواتر حسین کوڕی عەلی لەناو ئەوان وتارێکدا و وتی: ئەی خەڵکینە، پێغەمبەری خوا وتویەتی: هەر کەس پاشایەکی ستەمکار ببینێت کە نارەواکانی خوا رەوا دەکات و پەیمانی خوا دەشکێنێت و لەگەڵ شێوازی پێغەمبەر رێگەی ناسازگاری دەگرێتە بەر و لەبەرابەر بەندەکانی خوا بەزۆرداریەوە هەڵس و کەوت دەکات و ئەوکات بەوتار یا کردار لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری نەکات، لەسەر خوا پێویستە ئەو بکاتە شەریکی تاوانی ئەو زۆردارە. ئێستا بزانن ئەوان فەرمانبرداری شەیتانیان کرد و پشتیان کردە فەرمانەکانی یەزدان و زۆرداریان ئاشکرا کرد و فەرمانەکانی خوایان پشت گوێ خست و بەخششەکانی خەڵکیان تایبەت کرد بەخۆیان و نارەوای خوایان رەوا کرد و رەوای خوایان نارەوا و من شیاوترین کەسێکم بتوانم ئەم بارودۆخە بگۆڕم. نێردراو و نامەکانی ئێوە بەمن گەیشت و وتتان پشتم تێناکەن و دەست لەهاوکاری من هەڵناگرن و تەسلیمی دوژمنم ناکەن. ئەگەر لەسەر پەیمانەکەی خۆتان سوربن، بەرێگەی راستی و دروستی دەگەن. من حسین کوڕی عەلی کوڕی کچی پێغەمبەرم. گیانی من لەگەڵ گیانی ئێوەیە و بنەماڵەی من لەگەڵ بنەماڵەی ئێوە. دەبێت نمونەی ئێوە بم. ئەگەر ئەو کارە نەکەن و پەیمان بشکێنن و بەیعەتی من پشتگوێ بخەن، زۆر گرنگ نیە چونکە ئەو کارەتان لەگەڵ باوکم و براکەم و کوڕە مامەکەم موسلیم کوڕی عەقیل کرد. فریودراو ئەو کەسەیە فریوی ئێوە بخوات. لەبەشی خۆتان چاوتان پۆشی و بەختی خۆتان پێشێل کرد. هەر کەس پەیمانی بشکێنێت، لەزیانی خۆی دەیشکێنێت (فتح/٤٨/١٠) بەم زوانە خوا من لەئێوە بێ نیاز دەکات، سلاو وماڵئاوا.

حوڕ وتی: من سەبارەت بەخۆت سوێندت دەدەم سوێن بەخوا ئەگەر شەڕ بکەیت، بێ گومان دەکوژرێیت. حسین وتی: ئایا لەمەرگ دەمترسێنیت. ئایا دەتانەوێت من بکوژن؟ نازانم چی بەتۆ بڵێم! هەمان شت بەتۆ دەڵێم کە پیاوی ئەوسی بەکوڕە مامەکەی خۆی وت: ئەو دەیویست هاوکاری پێغەمبەری خوا بکات. پێی وت، دەکوژرێیت، بۆ کوێ

دەڕۆیت؟ وتی:

سامضی و ما بالموت عار علی الفتی اذا ما نوی حقا و جاهد مسلما

و واسی رجالا صالحین بنفسه و خالف مثبورا و فارق مجرما

فان عشت لم اندم و ان مت لم الم کفی بك ذلا ان تعیش و ترغما

یانی: من ئێستا بەرێدەکەوم و دەزانم مەرگ بۆ من هۆکاری نەنگ نیە بەتایبەت ئەو کاتەی ئەندێشەیەك چاکەت لەدڵدا بێت و موسڵمان ئاسا شەڕ بکات. گیانی خۆی لەرێگەی پیاوە چاکەکان ببەخشێت و شان بەشانی ئەوان شەڕ بکات. لەگەڵ خراپەکار بەرێگەی ناسازگاریدا بڕوات و لەگوناحکار خۆی بەدور بگرێت. ئەگەر زیندو مامەوە، پەشیمان نابمەوە و ئەگەر زیندو نەمێنم، سەرکۆنەم ناکەن. بۆ پیاو ئەو بەدبەختیە بەسە لەریسواییدا بژیت و لەروی ناچاریەوە بەریسوایی رازی ببێت.

کاتێك حوڕ ئەمانەی بیست، خۆی لێ دورخستەوە. ئەو بۆ سوچێك دەڕۆشت تا گەیشتە (عذیب الهجانات). هەجانەکانی نەعمان کوڕی مونزەر، پاشای عێراق لێرە دەلەوەڕان و لەبەر ئەمە بەو ناوە ناویان دەبرد (عذیب الهجانات، یانی شوێنی لەوەڕینی وشترە سپیە گرانباییەکان). لەم کاتەدا چوار کەس لەکوفەوە دەرکەوتن کە سوار لەسەر وشترەکانی خۆیان غاریاندەدا و ئەسپەکەی نافع کوڕی هیلالیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا. ناوی ئەم ئەسپە (کامل) بو. تێرماح کوڕی عودەی وەك رێنیشاندەر لەگەڵ ئەوان بو. ئەوان رویان کردە حسین. حوڕ روبەروی ئەوان بویەوە و وتی: ئەم چەند کەسە لەخەڵکانی کوفەن و من ئەوان دەگرم یا دەیانگەڕێنمەوە. حسین وتی: وەك گلێنەی چاوم پارێزگاریان لێدەکەم.. ئەوان هاورێیانی منن و هاوشێوەی ئەو کەسانەن کە لەمەککەوە لەگەڵ مندا هاتون. ئەگەر لەسەر وتارەکە و پەیمانەکەی نێوانمان ماویت، کارم نیە وەگەرنە شەڕ لەگەڵ تۆ دەست پێدەکەم. حوڕ دەستی لەوان هەڵگرت و حسین پێی وتن: لەبارودۆخی خەڵکان ئاگادارم بکەنەوە. یەکێك لەوان کە موجەممەع کوڕی عوبەیدالله‌ی عایزی بو، وتی: سەروەرانی خەڵك، بەرتیلی فراوان و گەورەیان وەرگرتوە و هەمانەکانیان پڕکراوە. ئەوان هەمویان یەك دەست و یەك زمان دژی تۆن. بەڵام ئەو خەڵکانەی لەپشت سەری ئەوانەوەن، دڵی ئەوان بەهەوای تۆ دەژیت بەڵام بەیانی شمشێر بۆ لەت لەت کردنی تۆ دەردەکێشن.

ئەو پرسیاری نێردراوەکەی خۆی قەیس کوڕی موسهێری کرد. هەواڵیان پێدا چی بەسەر هاتوە و چۆن کوشتویانە. فرمێسك لەچاوەکانی هاتەخوار و نەیتوانی گریانەکەی خۆی بشارێتەوە. دواتر ئەم ئایەی خوێندەوە: لەخواپەرەستان، خەڵکانێك هەن، ئەوەی لەگەڵ خوا پەیمانیان لەسەر بەستبو، بەراستی و دروستی بەکۆتاییان گەیاند. هەندێك لەوان کۆتاییان بەکارەکەیان هێنا و چاویان لەم جیهانە بەست و دەستەیەکیتر چاوەڕوانی پەیکی مەرگن، بەڵام هیچ کام بەهیچ شێوەیەك پەیمانی خۆیان لەگەڵ خوا نەگۆڕی (احزاب/٢٣/٣٣). ئەی خوایە، بەهەشت بەوان و بەئێمە ببەخشە و لەئارامگەی مێهرەبانی خۆت ئێمە و ئەوان کۆبکەرەوە و بەخشینەکانی خۆت بۆ ئێمە بپارێزە.

تێرماح کوڕی عودەی پێی وت: سوێند بەخوا من هاوڕێیانی زۆر لەدەوری تۆ نابینم و ئەگەر تەنیا ئەم سوپای کە تۆیان بازداشت کردوە، شەڕ لەگەڵ تۆ بکەن، بۆ شکاندنی خۆڕاگری تۆ بەسەندەیە. ڕۆژێك پێش هاتنەدەر لەکوفە، لەدەرەوەی شار، خەڵکانێکی فراوانم بینی کە هیچ کات چاوم لەگۆڕەپانێکی شەڕ تا ئەو ئەندازە شەڕکەری نەبینیوە. هەمویان بۆ شەڕی تۆ خۆیان ئامادە دەکرد. سوێندت دەدەم بەخوا ئەگەر دەتوانی تەنانەت یەك بست لەوان دور بکەویتەوە، لەم کارە خۆت بەدور مەگرە. ئەگەر دەتەوێت بەرەو شارەکانیتر بەرێکەویت کە لەوێ خوا بتپارێزێت، تا بۆچونی ڕاست بۆ تۆ ئاشکرا بێت و بارودۆخ بۆت ڕون ببێتەوە تا بڕیار بۆ ئەنجامدانی کارێك بدەیت، بەرێکەوە تا لەکوێستانی ئەجا دابەزی چونکە سوێندە بەخوا ئەم ئەو زنجیرە کێوەیە ئێمە لەبەرابەر غەسانیەکان و حیمیریەکان و نەعمان کوڕی مونزەر و هەر سور و سپیەك پەنامان بۆ ئەوێ دەبرد. سوێند بەخوا، هیچ کات لەوێ لاواز نەبوین. هاوڕێ لەگەڵ تۆ دێم تا تۆ بە (قریە) بگەیێنم. دواتر بۆ ئەو کەسانەی لەدو کوێستانی ئەجا و سەلمان، نێردراوەکانت ڕەوانە دەکەیت. سوێند بەخوا دە ڕۆژ ناخایەنێت خەڵکانی تەی پیادە و سوار ڕو لەتۆ دەکەن و پەپولە ئاسا لەدەوری چرای ژیانی تۆ دەسورێنەوە. ئەوسا تا ئەو کاتەی بتەوێت، لەناو ئێمەدا دەمێنیتەوە. ئەگەر پێشهاتێك ئارامی تۆ بشێوێنێت، بەڵێن دەدەم بیست هەزار شمشێر وەشێنی تایی لەدەوری تۆ کۆبکەمەوە کە پیاوانە شان بەشانی تۆ شەڕ بکەن. سوێند بەخوا تا یەك کەس لەوان زیندو بێت، کەس دەستی بەتۆ ناگات.

حسین کوڕی عەلی پێی وت: خوا پاداشتی چاکەی تۆ و خەڵکەکەت بداتەوە. لەناو ئێمە

و ئەم خەڵکە گفتوگۆیەك کراوە کە هەرگیز ناتوانین بگەڕێینەوە. خۆمان نازانین کاروبار وپێشهاتەکان چی دەبن. ئەو ماڵئاوایی لەحسین کرد و مژدەی پێدا خۆراك و توێشو بەبنەماڵەکەی بگەیێنێت و بۆ هاوکاری کردنی بگەڕێتەوە. ئەو کارەی کرد و بۆ هاوکاری حسین کوڕی عەلی گەڕایەوە بەڵام کاتێك گەیشتە عذیب الهجانات، بیستی کەحسین کوڕی عەلی کوژراوە. لەبەر ئەمە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە.

دواتر حسین بەرێکەوت تا گەیشتە (قصر بنی مقاتل). خێوەتێکی بینی. پرسی: ئەمە کێیە؟ وتیان: خێوەتی عوبەیدالله کوڕی حوڕی جوعەفی. وتی: بۆ لای من بانگی بکەن. کاتێك پەیك هات و پەیامەکەی دانا، کوڕی حوڕ وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). سوێند بەخوا لەکوفە نەهاتمەدەر مەگەر لەترسی ئەوەی حسین بێتە ئەو شارە و من لەوێ بم. سوێند بەخوا نەدەخوازم ئەو من ببینێت نە من چاوم بەو بکەوێت. نێردراو گەڕایەوە و حسینی لەپەیامی کوڕی حوڕ ئاگادار کردەوە. حسین کوڕی عەلی پێڵاوەکانی لەپێ کرد و بەرەو خێوەتەکەی ئەو بەرێکەوت و سڵاوی لێکرد و داوای لێکرد هاوکاری بکات. کوڕی حوڕ دوبارە قسەکانی هێنایە سەر زمان. حسین وتی: ئەگەر هاوکاریم ناکەیت، لەخوا بترسە و دژی من شەڕ مەکە. سوێند بەخوا کەس بانگەوازەکەی ئێمە نابیستێت و هاوکاری ئێمە ناکات مەگەر ئەوەی لەناو بچێت. کوڕی حور وتی: شەڕ کردن لەگەڵ تۆ، بەخواستی خوا هیچ کات ئەوە رو نادات.

دواتر حسین کوڕی عەلی هەستا و ڕۆشتە دەر و سوار ماینەکەی بو و ماوەیەك لەشەو پیاسەی کرد. سەری داخست و چاوەکانی لێك نا. لەناکاو سەری بەرز کردەوە و وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان. کوڕەکەی یانی عەلی کوڕی حسین (عەلی گەورە) ڕۆشتە لای و وتی: باوکە، گیانم قوربانی تۆ بێت، بۆ سەبارەت بەگەڕانەوە بۆ لای خوا قسەت کرد و بۆ چ کارێك سوپاسی خوات کرد؟ وتی: کوڕم، سەرم داخست و بۆ چەند ساتێك چاوەکانم لێکنا. سوارەیەك لەبەرچاوم دەرکەوت و وتی: ئەم خەڵکانە ڕێگەدەبڕن و مەرگ بەرەو لای ئەوان هەنگاو هەڵدەگرێت. زانیم گیانی ئێمە هەواڵی مەرگمان پێدەدەن. عەلی (گەورە) وتی: باوکە، خوا لەخراپە دورت بخاتەوە، مەگەر ئێمە لەسەر راستی و دروستی نین؟ حسین وتی: بەڵێ، سوێند بەو خوای بەندەکان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، لەسەر

راستی و دروستین. عەلی وتی: ئێستا ئیتر هیچ ترسێکمان لەمردن نیە کە لەسەر ڕێگەی ڕاستین. حسین وتی: خوا باشترین پاداشتێکت بداتەوە کە کوڕێك پاداشتی باوکی دەداتەوە.

کاتێك بەیانی داهات، نوێژی خوێند و بەخێرایی سوار بو و بەرەو لای ڕاست بەرێکەوت و هاورێکانیبەدوای خۆیدا. حوڕ هات و ئەو و هاورێکانی گەڕاندەوە. هەرجار کەدەیویست ئەوان بۆ کوفە بگەرێنێتەوە، خۆڕاگریان دەکرد و ڕازی نەدەبون. بەردەوام بەلای ڕاستدا دەڕۆشتن تا گەیشتنە نەینەوا وئەمە ئەو شوێنە بو کە حسین لەوێ دابەزی. کاتێك دابەزین، بینیان سوارەیەك لەکوفەوە بەرەو لای ئەوان ئەسپ غار دەدات. وەستان و چاوەڕوانیان کرد. سلاوی لەحوڕ کرد و سلاوی لەحسین و هاوەلانی نەکرد. نامەیەکی لەکوڕی زیاد بەحوڕدا کە بەمشێوە خوێندیەوە: دوای سلاو، هەر کاتێك نامەکەم بەدەستی تۆ گەیشت و پەیکی من گەیشتە لای تۆ، حسین بخەرە تەنگانەوە و لەشوێنێك ڕایبگرە و ڕێگە مەدە، جگە لەدەشتی تەخت و بێ قەلا و دور لەئاو دابەزێت. فەرمانم بەنێردراوەکەم داوە هاورێیەتی تۆ بکات و لەتۆ جیا نەبێتەوە تا هەوالم بۆ بێنێت کە فەرمانەکەت جێبەجێ کردوە. مالئاوا.

کاتێك حوڕ نامەکەی خوێندەوە، وتی: ئەمە نامەی فەرمانداره و فەرمان بەمن دەدات ئێوە بخەمە تەنگانەوە و لەم شوێنە کەنامەکەی بەمن گەیشتوە، ئێوە گەمارۆ بدەم. فەرمانی بەنێردراوەکەی داوە، لەمن جیا نەبێتەوە تا بزانێت فەرمانەکەی جێبەجێ دەکەم یا نا. حوڕ گەمارۆی خستە سەر ئەوان و ڕێگەی نەدەجان لەگوندێك یا لەسەر ئاوێك دابەزن. وتیان: ڕێگەمان بدە تا لەنەینەوا، یا غازریە یا شوفەیە دابەزین. وتی: ناتوانم. ئەم پیاوەیان وەك پاسەوانێك بەسەر سەری منەوە داناوە تا هەوالی کارەکانی من ببات. زوهەیر کوڕی قین بەحسینی وت: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا ئەوەی دوای ئەمە ڕودەدات، لەمە زۆر خراپتر دەبێت. شەڕ کردن لەگەڵ ئەم سوپایە، بۆ ئێمە ئاسانترە لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەو سوپای دوای ئەمە دێن. سوێند بەگیانی خۆم ئەوەندە کۆدەبنەوە کەتوانای خۆڕاگری لەبەرابەر ئەوانمان نابێت! حسین وتی: من شەڕ لەگەڵ ئەوان دەست پێ ناکەم. زوهەیر وتی: ئێمە ببە تا لەو گوندە دابەزین چونکە لەسەر لێواری فوراتە و بەهێزە. ئەگەر ڕێگەیان لێگرتین، شەڕیان لەگەڵ دەکەین چونکە

شەڕی ئێستا بۆ ئێمە ئاسانتر لەشەڕ لەگەڵ ئەو کەسانەیە دوای ئەمانە دێن. حسین وتی: ناوی ئەو گوندە چیە؟ وتی: (عقر). حسین وتی: لەعەقرەوە (ترس، یا کۆشکی داڕماو) پەنا بۆ تۆ دەهێنم خوایە. دواتر دابەزی. ئەمە لەرۆژی پێنج شەممە دوەم رۆژی موحەڕەمی ساڵی شەست و یەك / ٢ ئۆکتۆبەری ٦٨٠ زایینی بو.

کاتێك بەیانی داهات، عومەر کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص هاوڕێ لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر لەخەڵکانی کوفە گەیشت. هۆکاری هاتنەکەی ئەوە بو عوبەیداللە کوڕی زیاد ئەوی هاوڕێ لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بۆ (دەستبی) رەوانە کردبو کە دەیلەمیەکان لەوێ هێرشیان کردبوە سەر عەرەبەکان و سەرزەمینەکەیان لەدەست عەربەکان رزگار کردبو. کوڕی زیاد فەرمانی فەرمانداری رەی بۆ نوسیبو. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی لە (حمام اعین) خێوەتی هەڵدابو. کاتێك دەنگ و باسی حسین کەوتە ئاراوە، کوڕی زیاد بانگی کرد و وتی: بۆ شەڕی حسین بەرێکەوە. کاتێك شەڕ لەگەڵ حسین تەواو بو، دەڕۆیتە سەر کارەکەی خۆت. عومەر سەعد داوای لێبوردنی کرد. کوڕی زیاد وتی: کێشە نیە، فەرمانەکەمان بۆ بگەڕێنەوە. کاتێك ئەمەی بینی، کوڕی سەعد وتی: ئەمرۆ مۆڵەتم پێ بدە تا بزانم چی رودەدات. لەگەڵ هەر کەسێك راوێژی کرد بێ چەند و چون لەم کارە دوری خستەوە و ئاگاداری کردەوە. خوشکەزاکەی حەمزە کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبە هاتە لای و وتی: خاڵی بەڕێز، سوێندت دەدەم بەخوا شەڕ لەگەڵ حسین نەکەیت و پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕێنیت. سوێند بەخوا ئەگەر لەم جیهانەو سامان و پاشایەتی چاو بپۆشیت، باشتر لەوەی بەخوێنی حسین روبەروی خوا ببیتەوە. وتی: ئامۆژگاریەکانی تۆ لەگوێ دەگرم. شەوی تابەیانی بەبیرکردنەوە بەسەر برد تا بزانێت چ کارێك بکات. بیستیان کەدەیوت:

| | |
|---|---|
| ا اترك ملك الري و الري منيتي | ام ارجع مذموما بقتل حسين |
| حسين بن عمي و الحوادث جمة | لعمري و قر الري قرة عيني |
| و في قتله النار التي ليس دونها | حجاب و ملك الري قرة عيني |

یانی: ئایا دەستبەرداری فەرمانڕەوای رەی ببم کە دورترین ئارمانی منە، یا سەرکۆنەکراو لەکوشتنی حسین بگەڕێمەوە (حسین برازای باوکی منە و روداوەکان کەڵەکە کراون، سوێند بەخوا ناتوانم چاو لەرەی بپۆشم). لەکوشتنی ئەو ئاگرێکە کە

دابەزین لێی هیچ پەردەیەك نیە و پاشایەتی رەی روناکی چاوەکانی منە.

لەهەمان کات وەحی لەجیهانی شاراوە پێی وت:

فلاتز عمن الری یا اخسر الوری          تفوز به من بعد قتل حسین

یانی: ئەی زیان کارترینی هەمو خەڵکانی جیهان! هیچ کات گومان مەکە دوای کوشتنی حسین بتوانیت پاشایەتی رەی بەدەست بێنیت.

دواتر هاتە لای کوڕی زیاد و وتی: منت بۆ ئەم کارە راسپارد و خەڵك بیستیان. ئەگەر دەتوانی، بۆچونی من بەکار ببە. لەگەورەکانی کوفە چەند کەسێك بۆ شەڕی حسین رەوانە بکە چونکە لەشەڕدا پێویستم بەوانە. چەند کەسێکی ناو برد. کوڕی زیاد پێی وت: سەبارەت بەو کەسانەی رەوانەی دەکەم، راوێژ لەگەڵ تۆ ناکەم. ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ سوپاکەی من برۆ. وەگەرنە فەرمانەکەم بۆ بگەرێنەوە. عومەر سەعد وتی: دەرۆم. لەگەڵ ئەو سوپایە بەرێکەوت تا لای حسین دابەزی. کاتێك دابەزی، کەسی بۆ لای حسین رەوانە کرد و پرسی بۆ چ کارێك هاتوە. حسین پەیامی دا: خەڵکی شارەکەی ئێوە نامەیان بۆ نوسیم تا بگەمە لایان. ئەگەر نایانەوێت، دەگەرێمەوە. عومەر نامەیەکی بۆ کوڕی زیاد نوسی و ئەوی لەم قسانە ئاگادار کردەوە. کاتێك کوڕی زیاد نامەکەی خوێندەوە وتی:

الان اذ علقت مخالبنا به          یرجو النجاة و لات حین مناص

یانی: ئێستا کەدەستمان بەو گەیشتوە، هیوای رزگار بونی هەیە، بەڵام کاتی هەڵاتن نیە.

دواتر نامەی بۆ عومەر نوسی تا بەیعەتی یەزیدی پێ پێشنیار بکات، کەئەگەر ئەم کارە بکات، بیردەکەینەوە تا بزانین دەبێت چی لەگەڵدا بکەین. دەبێت دەستبەجێ رێگەی ئاوی لێ بگرێت و رێگە نەدات ئاو بەبنەماڵە و هاورێکانیشی بگات. عومەر سەعد، عەمرۆ کوڕی حەجاجی لەگەڵ پێنسەد سوار بۆ لای ئاوەکەی فورات رەوانە کرد کەلەوێ پارێزگاریان لەئاوە کرد و رێگەیان نەدا دەستی حسین بەئاوەکە بگات. ئەمە سێ رۆژ پێش کوژرانی حسین بو. عەبداللە کوڕی ئەبی حوصەین ئەزدی لەخەڵکانی بەجیلە، هاواری کرد: ئەی حسین، سەیری ئەم ئاوە ناکەیت؟ سوێند بەخوا یەك دڵۆپی ناخەیتە سەرزمان تا لەتینواندا گیان بدەیت! حسین وتی: ئەی خوایە، ئەو لەتینواندا بمرێنە و هیچ کات لەبەخشینەکانی خۆتی پێ مەبەخشە. ئەو داوتر نەخۆش کەوت، ئاوی

دەیخواردەوە بەڵام خێرا دەیهێنایەوە و دواتر ئەوەندەی دەخواردەوە لەتاو ئازار لەخۆی دەناڵا و دوبارە دەیهێنایەوە و دوبارە تینوی دەبو و دەیخواردەوە بەڵام تێراو نەدەبو. بەمشێوەیە تا مرد.

کاتێك تینویەتی تەنگی بەحسین و هاوەڵانی هەڵچنی. براکەی، ئەبولفەزڵ عەباسی کوڕی عەلی هاوڕێ لەگەڵ بیست کەسی پیادە کە مەشکەکانیان لەسەر شان بو و سی سوارکاریتری ڕەوانە کرد. ئەوان لەناوەکە نزیك کەوتنەوە و شەڕیان کرد و توانیان سەرکەوتن بەدەست بێنن و مەشکەکانیان پڕ کرد و گەڕانەوە. حسین، عەمرۆ کوڕی قەرەزە کوڕی کەعبی ئەنساری بۆ لای عومەر ڕەوانە کرد و پەیامیدا: ئەمشەو لەناو دوسوپاکە باچاومان بەیەك بکەوێت. عومەر ئەو کارەی کرد. ئەو دوانە کۆبونەوە و گفتوگۆ لەنێوان ئەوان درێژەی کێشا و دواتر هەرکام بۆ ناو سوپاکەی خۆی گەڕایەوە. حسین بەعومەر کوڕی سەعدی وت: لەگەڵ من بۆ لای یەزید کوڕی معاویە بگەرێرەوە، ئێمە دوسوپاکە بەجێ دەهێڵین. عومەر وتی: ماڵم وێران دەکات. وتی: من ماڵێکی باشترت بۆ دروست دەکەم. وتی: زەوی و بێستان و سامانەکانی من دەگرێت. باشتر و زیاتر لەو دارایی و سامانە لەحیجاز بەتۆ دەبەخشم. عومەر ئەمەی پەسەند نەکرد. خەڵك لەمبارەوە گفتوگۆیان کرد بێ ئەوەی یەك کەس ببیستیت کەچیان وت..

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو، بەڵکو حسین کوڕی عەلی پێی وت: بەیەکێك لەم سێ کارە لەلایەن منەوە ڕازی ببن: یا دەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوم، یا دەڕۆم و دەست دەخەمە ناو دەستی یەزید کوڕی معاویە و یا من بۆ سنوری یەکێك لەشارە ئیسلامیەکان دەبەن و یەکێك بم لەکۆمەڵانی خەڵك وئەوەی بەوان بگات، بۆ منیش بێت و ئەوەی دژی ئەوان بێت، دژی منیش بێت.

لەعوقەبە کوڕی سێمعان گێراویانەتەوە کە وتی: لەمەدینە تا مەککە و لەمەککە تا عێراق لەگەڵ حسین کوڕی عەلی بوم و تا کوژرا بۆ یەك سات لێی جیا نەبومەوە و هەمو گفتوگۆکانیم تا ڕۆژی کوژرانی لەگەڵ هەمو خەڵکان بیست. سوێند بەخوا هیچ کام لەم پێشنیارانە کەخەڵك باسی دەکەن کە دەیخواست دەست بخاتە ناو دەستی یەزید یا بڕواتە یەکێك لەشارە موسوڵمان نشینەکان، نەهاتە سەر زمانی ئەو. تەنیا وتی: ڕێگە بدەن بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوم. یا ڕێگە بدەن لەزەوی بەربڵاوی خواوەند

بسورێمەوە تا بزانم بارودۆخ و چارەنوسی خەڵکەکەم بەکوێ دەگات. ئەوان رازی نەبون. دواتر حسین و عومەر کوڕی سەعد سێ چوار جاریتر چاویان بەیەك کەوت. عومەر کوڕی سەعد بۆ عوبەیدالله کوڕی زیاد نامەی نوسی:

دوای سڵاو، خواوەند ئاگری دامرکاندەوە و قسەمانی کردە یەك. حسین کوڕی عەلی پەیمانی پێدام بۆ ئەو شوێنە بگەڕێتەوە کەلێی هاتوە، یا بۆ هەر سنورێك لەسنورەکان کە بخوازین، رەوانەی بکەین، یا خۆی بڕواتە لای سەروەری باوەڕداران یەزید کوڕی معاویە و دەست بخاتە ناو دەستی. ئەمە هۆکاری رەزامەندی ئێوە و باشبونی بارودۆخی ئۆمەتە. کاتێك کوڕی زیاد نامەکەی خوێندەوە، وتی: ئەمە نامەی پیاوێکی چاکەخواز بۆ فەرماندارەکەی خۆی و مێهرەبان بۆ خەڵکەکەی خۆیەتی، بەڵێ، رازیم.

شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن هەستا و وتی: ئێستا ئەو لەسەرزەمینی تۆ و لای تۆ دابەزیوە، ئایا رازی دەبیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر بۆ یەکێك لەسەرزەمینەکانی تۆ کۆچ بکات و دەست نەخاتە دەستی تۆ، ئەو شیاوترە بۆ بەهێزی و تۆ بۆ لاوازی. ئەم پێگەی پێ مەبەخشە کەدەبێتە هۆکاری ناتەوانی و لاوازی تۆ. دەبێت ئەو هاوەڵانی سەر بۆ فەرمانەکانی تۆ دانەوێنن. ئەگەر سزا بدەیت، بۆ ئەو کارە بەتوانا بیت، ئەگەر لێیان خۆش بیت، بەخواستی خۆت بێت. سوێند بەخوا ئاگاداریان کردومەتەوە کە حسین و عومەر، شەوان بەگفتوگۆ لەناو سوپاکە بەسەر دەبەن.

کوڕی زیاد وتی: ئاماژەت بەبۆچونێکی باش دا! هەر ئێستاکە ئەم نامەیە بۆ عومەر کوڕی سەعد ببە. دەبێت گوێرایەڵی فەرمانەکانی من بەحسین پێشنیار بکات. ئەگەر رازی بن، ئەوان لەرێگەی ئاشتیەوە بۆ بارەگاکەی من رەوانە بکات و ئەگەر رازی نەبون، شەڕ لەگەڵ ئەوان دەست پێبکات. ئەگەر عومەر کوڕی سەعد بەم فەرمانە رازی بو، تۆ فەرمانبەر و گوێرایەڵی ئەو بە و ئەگەر رازی نەبو، خۆت فەرماندەیی بگرە دەست و عومەر کوڕی سەعد بکوژە و سەرەکەی بۆ من رەوانە بکە. هاوڕێ لەگەڵ ئەو نامەیەکی بەم شێوە بۆ عومەر کوڕی سەعد نوسی: دوای سڵاو، من تۆم بۆ لای حسین کوڕی عەلی رەوانە نەکرد، بیلاوێنیتەوە یا هیوایی پێ ببەخشی یا رۆژگاری بۆ درێژ بکەیتەوە یا لەنێوان ئێمە و ئەو نێوەنجیگەری بکەیت. ئەگەر حسین و هاوەڵانی ملکەچی فەرمانەکانی من و پێی رازی بون، لەرێگەی ئاشتیەوە ئەوان رەوانەی لای من بکە و

ئەگەر خۆیان بەدور گرت، بەرەو لای ئەوان غار بدە تا کوشتاریان بکەیت و جەستەیان لەت لەت بکەیت چونکە بۆ ئەو کارە شیاون. ئەگەر حسینت کوشت، سوار لەسەر ئەسپ لەسەر سك و سەر و سینە و پشتی غار بدە چونکە نافەرمان و ئاژاوە چی و پچڕێنەری پەیوەندی و بێدادگەرە. ئەگەر فەرمانەکەمان بەکار ببەیت، پاداشتی گوێرایەڵیت پی دەبەخشین و ئەگەر فەرمانەکەمان جێبەجێ نەکەیت، لەفەرماندەیی سوپاکە خۆت بەدور بگرە و کارەکان بەشیمر بسپێرە. ماڵئاوا.

کاتێك شیمر نامەکەی وەرگرت، عەبداللە کوڕی ئەبی محەل کوڕی حزام لای کوڕی زیاد بو. پوری ئەو ام البنین کچی حزام هاوسەری عەلی بو و عەبداللە و عەباس و جەعفەر و عوسمانی بۆ هێنابویە دنیا. ئەو بەکوڕی زیادی وت: ئەگەر دەتوانی ئەمان نامەیەك بۆ خوشکەزاکانی ئێمە بنوسی، ئەو کارە بکە. ئەو ئەمان نامەی بۆ ئەوان نوسی و عەبداللە بەکۆیلەکەی خۆی بۆ لای ئەوان رەوانەی کرد. کاتێك نامەکەیان بینی، وتیان: ئێمە پێویستمان بەئەمان نامەی تۆ نیە. ئەمانی خوا باشترە لەئەمانی کوڕی سومەییە. کاتێك شیمر نامەکەی زیاد بەدەستی عومەر کوڕی سەعد گەیاند، وتی: تۆ چیت، خوا فێزەون بکات ئەوەی هێناوتە! سوێند بەخوا گومان دەکەم تۆ رێگریت لێ کردوە کە رازی ببێت بەوەی بۆم نوسیبو. کارێکت خراپ کرد کە هیوامان دەکرد بەچاکە کۆتایی پێبێت. سوێند بەخوا حسین هیچ کات ملکەچی فەرمانەکانی کوڕی زیاد و کوڕی سوفیان نابێت. سوێند بەخوا گیانی باوکی لەجەستەی ئەودایە. شیمر وتی: دەتەوێت چی بکەیت؟ وتی: سەرپەرەستی ئەم کارە لەئەستۆ دەگرم. شەوی پێنج شەممە نۆ رۆژی تێپەڕیو لەموحەڕەم/ ٩ ئۆکتۆبەری ٦٨٠ پێشڕەویان دەست پێکرد. شیمر هات و عەباس کوڕی عەلی و براکانی بانگ کرد. ئەوان هاتنەدەر. وتی: ئەی خوشکەزاکانی من ئێوە ئاسودەن و ئەمان بەخشراون. وتیان: خوا خۆت و ئەمانەکەت نفرین بکات! ئەگەر خاڵی ئێمەیت بۆ ئەمانمان پێ دەبەخشیت و ئەمان بەکوڕی پێغەمبەری خوا نابەخشیت؟

دواتر عومەر سواربو و خەڵك هاورێ لەگەڵ ئەو سوار بون. ئەمە لەکاتی نوێژی ئێوارێ و حسین شمشێر لەدەست لەبەردەم ماڵەکەی خۆی لەسەر زەوی دانیشتبو. سەری خستە سەر ئەژنۆ و کەمێك حەوایەوە. خوشکەکەی زێنەب دەنگە دەنگی سوپاکەی بیست و خۆی پێگەیاند و خەبەری کردەوە. سەری هەڵگرت و وتی: پێغەمبەری خوام لەخەودا

بینی کە فەرموی: سبەی شەو میوانی ئێمەیت. خوشکەکەی شەقەزللەیەکی لەروخساری خۆیدا و وتی: ئەی هاوار! حسین وتی:خوشکم، هاوار بۆ تۆ رەوا نیە، ئارام بە خوا بتپارێزێت. عەباسی برای پێی وت: ئەی برای من، ئەم خەڵکە بۆ لای تۆ دێن. حسین هەستا و وتی: خۆم سوار دەبم. عەباس وتی: نا من دەڕۆم. حسین وتی: سوار بە و کاتێك بەوان گەیشتیت، بپرسە، چیتان دەوێت؟ بۆ لەم کاتەی رۆژ هێرشتان دەست پێکردوە؟ لەوان بپرسە بۆ هێرش دەکەن؟ ئەو هاورێ لەگەڵ بیست سوار و لەناو ئەوان زوهەیر کوڕی قەیس بەرێکەوت و رۆشتە لای ئەوان و لەمەبەستەکەیان پرسیاری کرد. وتیان: فەرمانی فەرماندار گەیشتوە تا فلأن کار و فیسارە کار بکەین. وتی: پەلە مەکەن تا بۆ لای باوکی عەبدالله بگەڕێمەوە و پەیامەکەی ئێوە بگەیێنم. ئەوان وەستان و عەباس بەپەیامەکە گەڕایەوە. هاورێکانی وەستان و ئامۆژگاری ئەوانیان دەکرد و بەردەوام خوایان بیر دەخستنەوە. کاتێك عەباس پەیامەکەی بەحسین گەیاند، حسین پێی وت: بگەڕێرەوە و ئەگەر توانیت تا بەرەبەیانی بەیانی مۆڵەتیان لێ وەربگرە تا ئەمشەو نوێژ بخوێنین و لەخوا بپارێینەوە و داوای لێخۆشبونی لێ بکەین چونکە خۆی دەزانێت من دڵدادەی نوێژ و خوێندنی نوسراوەکەی ئەو و راز و نیاز لەگەڵ ئەوم. عەباس بۆ لای ئەوان گەڕایەوە و وتی: ئەمشەو بگەڕێنەوە تا لێکۆڵینەوە لەسەر داواکانتان بکەین، کاتێك بەرەبەیانی بەیانی داهات، بەخواستی خوا چاومان بەیەك دەکەوێت. یا بەپێشنیارەکەتان رازی دەبین یا نە.

عومەر کوڕی سەعد وتی: ئەی شیمر بارودۆخ چۆن دەبینیت؟ وتی: فەرماندە تۆی. ئەو روی کردە خەڵکەکە و وتی: چی دەبینن؟ عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی وتی: پەنا بەرخوا، ئەگەر لەخەڵکانی دەیلەم دەبون و ئەم داواکاریەیان لەئێوە دەکرد، شیاو بو رازی ببن. قەیس کوڕی ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: رازی ببە چونکە سوێند بەگیانی خۆم، بەرەبەیانی بەیانی بۆ شەڕ روبەروی تۆ دەبنەوە. عومەر کوڕی سەعد وتی: ئەگەر بزانم ئەو کارە دەکەن، ئەمشەو مۆڵەتیان پێ نادەم. دواتر گەڕایەوە.

دوای گەڕانەوەی عومەر، حسین هاوەڵانی کۆکردەوە و وتی:بەچاکترین زمان سوپاسی خوا دەکەم و لەچاکە و خراپە رێز لەبەخشینەکانی ئەو دەگرم. ئەی خوایە، سوپاست دەکەین کە ئێمەت بەهۆی پێغەمبەرەکەتەوە پاراست و چاو و دڵ و گوێ و زمانت

پێبەخشین و قورئانت فێر کردین و ئێمەت کردە شارەزای دین، کەواتە ئێمە لەناو ریزی سوپاسکەران جێ بکەرەوە. دوای سلاو، من هاورێیانی باشتر و هاودەستتر لەهاورێیانی خۆم نابینم و بنەماڵەیەکی چاکەکارتر لەبنەماڵەکەی خۆم. خوا لەمنەوە باشترین پاداشتەکان بەئێوە بدات. ئێستاکە بزانن من کاروبارەکانی خۆم بۆ روبەروبونەوویە بەیانی لەگەڵ ئەم کەسانە هەڵدەسەنگێنم. فەرمانم بەهەموتان دا کەبڕۆن. لەلایەن منەوە ئازادن و هیچ پەیمانێك لەئەستۆی ئێوەدا نیە. ئێستاکە شەو داهاتوە، شەو ئەسپەکانی خۆتان ئامادە بکەن و هەر کام لەئێوە دەستی یەکێك لەکەسەکانی بنەماڵەی من بگرێت و لەگەڵ خۆیدا ببیات. خوا پاداشتی هەموتان بداتەوە. دواتر لەشارەکاندا بلاو ببنەوە و لەناو سەرزەمین و گوندەکانی خۆتان ئارام بگرن تا خوا رێگەچارەکان بکاتەوە. ئەم خەڵکانە منیان دەوێت و ئەگەر دەستیان بە من بگات، لەگەڕان بەدوای کەسانیتر دەست هەڵدەگرن. براکان و کوڕەکان و برازاکانی و کوڕەکانی عەبداللە کوڕی جەعفەر پێیان وت: بۆ ئەم کارە بکەین؟ کە دوای تۆ زیندو بین! خوا هەرگیز ئەو رۆژەمان نیشان نەدات. حسین وتی: ئەی منداڵەکانی عەقیل، گیان بەخشینەکەی عەقیل بۆ ئێوە بەسە. بڕۆن چونکە فەرمانم بەئێوەدا. وتیان: چی بەخەڵکان بڵێین؟ بڵێین: رێبەر و سەروەری و کوڕە مامەکەمان، لەپشت سەرمانەوە بەجێهێشت بێ ئەوەی یەك تیر بهاوێژین یا رم و شمشێرێك بوەشێنین. ئێستا نازانین چی بەسەر هاتوە. سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەین بەڵکو خۆمان و سامانی خۆمان لەم رێگادا دەبەخشین و شان بەشانی تۆ شەڕ دەکەین. خوا دوای تۆ ژیان قێزەون بکات.

موسلیم کوڕی عەوسجەی ئەسەدەی هەستا و وتی: هێشتا داوای لێخۆشبونمان لەخوا نەکردوە و ئەوەی دەبێت بۆ تۆمان ئەنجام نەداوە. ئێستا بەمشێوەیە بەجێت بێڵین؟ سوێند بەخوا لەتۆ جیا نابمەوە و بەرم سینەی ئەوان دەقڵیشێنم و تا دەسکی شمشێر لەدەستمدا بێت، کوشتاریان دەکەم. سوێند بەخوا ئەگەر کەرەستەی شەڕم دەست نەکەوێت بەردبارانیان دەکەم و بەرگری لەتۆ دەکەم تا هاورێ لەگەڵ تۆ گیان ببەخشم. هاورێکانیتریش بەمشێوە قسەیان کرد و حسین سوپاسی هەمویانی کرد.

خوشکەکەی زێنەب لەو شەوەدا بیستی کە لەخێوەتەکەی خۆی دانیشتوە و شمشێرەکەی بۆ بەیانی تیژ دەکات و (حوەی) کۆیلەکەی ئەبوزەری غەفاری لای ئەو دانیشتوە. ئەو

دەڵێت:

| | |
|---|---|
| یا دهر اف لك من خلیل | كم لك بالاشراق و الاصیل |
| من صاحب او طالب قتیل | و الدهر لا یقنع بالبدیل |
| و انما الامر الی الجلیل | و كل حی سالك سبیل |

یانی: تف لەتۆ ئەی چەرخی گەردون، تف لەتۆ! چەندە زۆر کە لەبەرەبەیانان و ئێواران، هەر هاورێ و دۆستێکت خستە قورگی مەرگەوە، رۆژگار بەجێگر بەسەندە ناکات. کاروبارەکان لەدەست خوای گەورەدایە و هەر زیندوێك بەرێگەیەکدا دەڕوات.

دوسێ جار ئەم هۆنراوەی هێنایە سەر زمان. کاتێك خوشکەکەی ئەمەی بیست، نەیتوانی خۆی بگرێت. هەستا و بەرەو لای ئەو ڕۆیشت. هاواری کرد: ئەی هاوار پرسەگێر بوین! خۆزگە مەرگ منی لەقورگی ئەم ژیانە پڕ نەهامەتیە رزگار دەکرد! دایکم فاتیمە و باوکم عەلی و براکەم حەسەن لەم جیهانە ڕۆشتن. تۆ یادگاری رابردوان و پەنادەری پاشماوەکانی. حسین ڕۆشت و سەیری کرد، وتی: ئەی خوشکە، ئاگاداربە شەیتان خۆراگری تۆ نەرفێنێت. زێنەب وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، باسی کوشتنت کرد! گیانم بەقوربانت بێت! حسین بەدژواری ئاوی دەمی قووتدا و فرمێسك لەچاوەکانی هاتە خوار. دواتر وتی: ئەگەر مەلی بەردخۆر شەوێکی ئارامی بۆ دەستەبەر بکەن، کەمێك دەحەوێتەوە. زێنەب لەخۆیدا و وتی: ئایا خۆت بەناتەوان دەبینیت؟ ئەمە زیاتر دڵم دەسوتێنێت و ئاگرم تێبەردەدات. دواتر شەقەزللەیەکیتری لەخۆیدا و یەخەی خۆی دڕاند و بێ هۆش کەوتە سەرزەوی. حسین هەستا و ئاوی بەروخساریدا پرژاند و وتی: خوشکم، لەخوا بترسە بەتەناق نەپچڕاوی خوا خۆت ناوێزان بکە. بزانە کەخەڵکانی سەرزەوی دەمرن و ئاسمانیەکان نامێننەوە و هەمو شتێك جگە لەخوای تاقانە رێگەی لەناوچون دەگرێتەبەر. باوك و دایك و براکەم هەمویان لەمن باشتر بون و مردن. من و ئەوان هەر کەسێك دەبێت لەپێغەمبەر نمونەیەك بۆ خۆمان دروست بکەین. بەم قسانە دڵداری دایەوە و دواتر وتی: خوشکە، سوێندت دەدەم ئەگەر کوژرام، یەخەی خۆت نەدڕێنیت و روخساری ناسکتر لەگوڵی خۆت نەڕمنجێنیت و شین نەکەیت و پرسەم بۆ نەگێڕیت.

دواتر هاتەدەر و فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا و خێوەتەکانیان لەیەك نزیك کردەوە و

تەناف خێوەتەکانیان لەیەك ئاڵاند و خۆیان لەبەردەم خێوەتەکان ریزیان بەست تا لەیەك لاوە روبەروی دوژمن ببنەوە و خێوەتەکان لەچەپ وراست و پشت سەریان بێت. کاتێك شەو داهات، هەمویان تا بەیانی بەناگا مانەوە و بەنوێژ خوێندن و راز و نیاز لەگەڵ خوا سەرقاڵ بون. کاتێك عومەر کوڕی سەعد نوێژی بەیانی رۆژی شەممە یا هەینی (عاشورا) دەیەم رۆژی مانگی موحەرەم /١٠ ئۆکتۆبەری ٦٨٠ زایینی، بەجێهێنا، لەگەڵ هاورێکانی خۆی هاتەدەر و ئاهەنگی بارەگای حسین کوڕی عەلی کرد. حسین هاورێیانی خۆی بۆ شەڕ رازاندەوە و بۆ نوێژی بەیانی ریزیان بەست. سی و دو سوار و چل و دو پیادە هاورێیەتیان دەکرد. زوهەیر کوڕی ئەلقینی کردە فەرماندەی باڵی راست. حەبیب کوڕی موتەهەری لەباڵی چەپ دانا و ئاڵاکەی بەبراکەی عەباس بەخشی. فەرمانیدا دار و چیلکە و قامیشیان کۆکردەوە و لەشوێنە چاڵەکاندا کەڵەکەیان کردن و بەمشێوەیە پارێزگاریان لەپشت سەری خۆیان کرد. ئەم چاڵانە هاوشێوەی سەنگەر یا جۆگەیەکی سەراسەری بون کەشەوانە لەدەوری خۆیان هەڵیانکەندبو و ئێستا ئاگریان تیا دەکردەوە تا دوژمنان نەتوانن لەپشتەوە زیانیان پێ بگەیێنن. و ئەم کارە هاوکاری کردن.

عومەر کوڕی سەعد، عەبدالله کوڕی زوهەیری ئەزدی کردە فەرماندەی شەڕکەرانی مەدینە، فەرماندەی خەڵکانی رەبیعە و کێندە ئەشعەس کوڕی قەیس، فەرماندەی خەڵکانی مێزحەج و ئەسەدیەکان عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی سەبرەی جوعفی، فەرماندەی بەنی تەمیم و هەمەدان حوڕ کوڕی یەزیدی ریاحی، فەرماندەی باڵی راست عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی، فەرماندەی پیادەکان شەبس کوڕی رێبعی یەربوعی تەمیمی. ئاڵاکەی بەکۆیلەکەی بەرید سپارد. هەموی ئەم کەسانە لەگەڵ حسین کوڕی عەلی شەڕیان کرد جگە لەحوڕ کوڕی یەزید کە پەیوەستی حسین بو و شان بەشانی ئەو کوژرا.

کاتێك لەحسین نزیك کەوتنەوە، فەرمانیدا و خێوەتێکیان بۆ هەڵدا. دواتر فەرمانیدا کەمێك بۆنی خۆشیان هێنا و لەقاپێکی گەورەدا تێکەڵ بەناویان کرد. لەم کاتەدا حسین رۆشتە ژوور و خۆی شۆرد وسەر و جەستەی گوڵاوپرژێن کرد و شادان و چالاك هاتەدەر. عەبدولرەحمان کوڕی عەبد رەبە و بەریر کوڕی خەزیری هەمەدانی لەبەردەرگای

خێوەتەکە وەستان و هەر کامیان هەوڵی دەدا دوای حسین بڕوات و بەوشێوەیە خۆی برازێنێتەوە. بەریر دەستی بەگاڵتە کردن لەگەڵ عەبدولرەحمان کرد. عەبدولرەحمان پێی وت: سوێند بەخوا ئێستا کاتی گاڵتە و شۆخی نیە. بەریر وتی: خەڵکەکەم باش دەزانن من لەگەنجی و پیریدا تاقەتی گاڵتە و شۆخیم نەبوە، بەڵام لەو بەڵای بەسەرمان دێت، شادمانم. سوێند بەخوا نێوان ئێمە و کچە چاو جوانەکانی بەهەشتی تەنیا ئەوە ماوەتەوە کەئەوان بەشمشێر هێرش بکەنە سەرمان و ئەوسا ئێمە یەکسەر بۆ ئامێزی ئەوان بفڕین. کاتێك حسین تەواوبو، ئەو دوانە ڕۆشتنە ژوور. دواتر حسین کوڕی عەلی سوار ئەسپەکەی خۆی بو و داوای قورئانێکی کرد و لەبەردەم خۆیدا دایناو هاوڕێکانی لەپێش ئەو شەڕیان دەستی پێکرد. هەردودەستی خۆی بەرز کردەوە و هاواری کرد: ئەی خوایە هۆکاری بۆ بەهێزی من لەبەرابەر هەر خەمێك و هیوایی من لەهەر دژواریکدایت. هەر پێشهاتێك روبدات، تۆ بەهۆکاری پشت گەرمی خۆم دەزانم. چەندە زۆرن ئەو دڵانەی لاواز دەبن و ڕێگە چارەکان کەم دەبێتەوە و هاوڕێ دەست لەهاوکاری کردن هەڵدەگرێت و دوژمن سەرکۆنە دەکات، دەستم لەکەسانیتر شۆرد و تەنیا پشتم بەتۆ بەست و تۆ دەرگات کردەوە و پاکت کردەوە و ئەوە بۆ من بەسە. تۆ سەرەپەرەستی من لەهەر بەخشینێك و خاوەندی هەر چاکەیەك و مەبەستی هەر روتێکردنێکی.

کاتێك هاوڕێیانی عومەر کوڕی سەعد بینیان، ئاگر لەقامیشەکان بڵێسە دەسەنێت، شیمر بانگی حسینی کرد: پێش ڕۆژی هەستانەوە ئاگرت بۆ خۆت دروست کرد. حسین ئەوی ناسیەوە و وتی: تۆ شیاوتریت بۆ ئەوەی هەم لەم ئاگرەدا بسوتێیت هەم لەئاگری جەهەننەم.

دواتر حسین سوار وشترەکەی خۆی بو و لەسوپای دوژمن نزیك کەوتەوە و بەدەنگێکی بەرز کەهەمو خەڵکان بیستیان، هاواری کرد: گوێ لەوتاری من بگرن وبۆ شەڕ کردن لەگەڵ من پەلە مەکەن تا ئەوەی پێویستە لەسەر من تەواوی بکەم و ئامۆژگاریتان بکەم و لەهاتن بۆ لای ئێوە داوای لێخۆشبون بکەم. ئەگەر بەهۆکاری هاتنەکەی من رازی ببن و وتەکانی من بەراست بزانن و مافەکانم پێ ببەخشن، خۆتان لەم کارە بەختەوەرتر دەبن و بەمشێوەیە ئێوە کارتان بەمن نابێت. ئەگەر بەدوای لێخۆشبونی من رازی نەبن(

کاری خۆتان دەست پێ بکەن و شەریکەکانتان کۆبکەنەوە و تا کارەکەتان نەبێتە هۆی پەشیمانی و ئەوسا بەشێوەیەکی سەراسەری هێرش بکەنە سەر من و مۆڵەتم پێ مەدەن) (یونس/٧١/١٠). پەروەردگاری من ئەو خوایە قورئانی رەوانە کرد و ئەو سەروەری هەمو چاکەکارانە (اعراف/١٩٦/٧). دەڵێت: کاتێك خوشکەکانی دەنگی ئەویان بیست، گریان و شین و رۆرۆیان دەست پێکرد و دەنگی خۆیان بەرز کردەوە. براکەی عەباس و کورەکەی عەلی بۆ لای ژنەکان گەراندەوە تا ئەوان ئارام بکەنەوە. وتی: بەگیانی خۆم سوێند زۆر دەگرین. کاتێك ئەم دوانە رۆشتن، وتی: کوری عەباس دور مەبە. ئەمەی لەکاتێکدا وت کەئاوازی گریانی ئەوانی بیست چونکە کوری عەباس ئامۆژگاری کردبو کە ئەوان لەگەڵ خۆیدا بۆ عێراق نەبات.

کاتێك ژنەکان ئارام بونەوە، سوپاسی خوای کرد و سلاوی بۆ محەممەد و فریشتەکان نارد. قسەی زۆری هێنایە سەرزمان بەلام ناتوانین ئاماژە بەهەمویان بدەین. پیاوێك لەو قسە خۆشتر و زمان پاراوتر نەبینراوە. دواتر وتی: دوای سلاو، بیر لەنەژادی من بکەنەوە و بزانن من کێم. ئەوسا بۆ ناخی خۆتان بگەرێنەوە و لێکۆڵینەوە بکەن ئایا بۆ ئێوە رەوا و دروستە بمکوژن و رێزی من نەگرن. مەگەر من کوری کچی پێغەمبەرەکەی ئێوە و کوری جێگر و کوری مامی ئەو نیم. مەگەر کوری ئەو کەسە نیم یەکەم کەس باوەری بەئیسلام هێنا؟ ئایا حەمزە سەروەری شەهیدان مامی باوکی من نیە؟ جەعفەری هەڵفرِ بەرەو بەهەشت مامی من نیە؟ ئەو وتارەی لەپێغەمبەر بەهەموان گەیشتوە، مەگەر نەتانبیستوە کە سەبارەت بەمن و براکەم چی فەرمو: ئەم دوانە سەروەری گەنجەکانی بەهەشت هۆکاری روناکی چاوی لایەنگرانی شوێنکەوتەی پێغەمبەرن؟ ئەگەر وتەکانی من بەراست و خۆم بەراستگۆ دەزانن، ئێدەگەن کە هیچ کات بەمەبەستێکی پێشتر درۆم نەهێناوەتە سەر زمان چونکە دەزانم خوا درۆزنەکانی خۆش ناوێت. ئەگەر وتارەکەی من بەناراست دەزانن، لەناو ئێوەدا کەسانێك هەن کەئەگەر لێیان بپرسن ئێوە ئاگادار دەکەنەوە. لەجابر کوری عەبداللە ئەنساری یا ئەبو سەعیدی خدری یا سەهل کوری سەعید یا زەید کوری ئەرقەم یا ئەنس کوری مالك بپرسن تا ئێوە ئاگادار بکەنەوە چونکە ئەوان لەخودی پێغەمبەریان بیستوە. ئایا ئەمانە ئێوە لەرشتنی خوێنی من دور ناخاتەوە؟

شیمر پێی وت: ئەگەر بزانم چی دەڵێیت، خوا تەنیا بەیەك شێوە پەرستیوە! حەبیب کوڕی موتەهەر پێی وت: سوێند بەخوا تۆ خوا بەحەفتا شێوە دەپەرستی. خوا مۆری لەدڵی تۆداوە و لەبەر ئەمە نازانی دەڵێی چی.

دواتر حسین وتی: ئەگەر گومان لەقسەکانم دەکەن یا باوەڕ ناکەن کە من کوڕی کچی پێغەمبەرەکەی ئێوەم، سوێند دەخۆم کە لەرۆژهەلاتەوە تا رۆژئاوا جگە لەمن کەس کوڕی کچی پێغەمبەری خوا نیە، نە لەئێوە نە لە کەسانیتر. پێم بڵێن، ئایا بەدوای خوێنی کوژراوێکن کە من خوێنیم ڕشتبێت؟ ئایا سامانەکانی ئێوەم بەفیڕۆ داوە؟ یا کەسێك لەئێوەم بریندار کردوە کە داوای تۆڵە کردنەوە دەکەن؟ ئەوان وەڵامیان نەدایەوە. هاواری کرد: ئەی شەبسی ڕێبعی، حەجار کثبەجەر، قەیس کوڕی ئەشعەس، زەید کوڕی حارس، مەگەر ئێوە نامەتان بۆ نەنوسیم بێم بۆ لای ئێوە. وتیان: ئەو کارەمان نەکردوە. حسین وتی: بەڵێ، ئەو کارەتان کرد. دواتر وتی: ئەی خەڵکینە، ئەگەر من پەسەند ناکەن ڕێگەم بدەن بۆ شوێنێکی ئارام و ئاسودە لەسەر زەوی بگەڕێمەوە.

قەیس کوڕی ئەشعەس پێی وت: ئایا ملکەچی فەرمانەکانی کوڕی مامەکەت کوڕی زیاد نابیت؟ بزانە تەنیا باشی دەبینی. حسین پێی وت: تۆ برای براکەی خۆتیت، ئایا دەتەوێت هاشمیەکان زیاتر لەخوێنی موسلیم کوڕی عەقیل داوا بکەن؟ نە سوێند بەخوا ، نە هاوشێوەی کەسە داماوەکان دەست دەخەمە ناو دەستی ئەوان و نە هاوشێوەی کۆیلەکان و هیچ کات تاوانی گوناحێك لەئەستۆ ناگرم کە ئەنجامم نەداوە. بەندەکانی خوا من بۆ خوای خۆم و خوای ئێوە پەنا دەبەم کە بەردباران بکەن، بۆ خواوەندی خۆم و ئێوە لەهەر یاخیگەریەك پەنا دەبەم کە باوەڕ بەرۆژی کۆتایی ناهێنێت. دواتر وشترەکەی خەواند و دابەزی.

زوهەیر کوڕی قین سوار ئەسپەکەی خۆی بەکەرەستەی شەڕ هاتەدەر و وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، بترسن، لەئەشکەنجەی خوا بترسن. لەسەر موسوڵمانان پێویستە چاکەی موسوڵمانانیان بوێت و ئامۆژگاریەکان لەو دریغ نەکەن. ئێمە تا ئێستا برای یەکەین و لەسەر یەك دینین ئەمە تا ئەو کاتەیە کە شمشێر لەیەك بەرز نەکەینەوە.

کاتێك شمشێر بەرز بکرێتەوە، پەیوەندی خزمایەتی دەپچرێت و ئێمە لەسەر دینێك دەبین و ئێوە لەسەر دینێك. خواوەند ئێمە و ئێوەی لەسەر بنەماڵەی محەممەد گرفتاری

تاقی کردنەوە کردوە تا بزانێت ئێمە و ئێوە چی دەکەین. ئێمە پێشنیاری هاوکاری کردنی حسین و دەست هەڵگرتن لەهاوکاری کردنی ستەمکاری ستەمکار زادە یانی کوڕی زیادتان پێ دەکەین. ئێوە لەم دو خراپەکارە تەنیا خراپەتان بینیوە، چاوەکانی ئێوە فریو دەدەن، دەست و پێی ئێوە دەبڕن، لاشەی کوژاروەکانتان لەت لەت دەکەن، ئێوە بەدار خورماکانەوە هەڵدەواسن، باشەکانتان دەکوژن وسەروەرانی ئێوە لاواز دەکەن و قورئان خوێنەکانتان هاوشێوەی حوجر کوڕی عودەی و هاوڕێکانی و هانی کوڕی عوروە و هاوشێوەکانی بەرەو هەڵدێری لەناوچون دەبەن.

دەڵێت: ئەوان جوێنیان پێدا و وەسفی کوڕی زیادیان کرد و وتیان: لەشوێنی خۆمان ناجوڵێین تا سەروەری ئێوە و هاوەڵانی کوشتار بکەین یا ئەو و هاوڕێکانی لەسەر بنەمای ئاشتی بۆ لای کوڕی زیاد ببەین. پێی وتن: ئەی بەندەکانی خوا، منداڵەکانی فاتیمە بۆ هاوڕێیەتی شیاوترن لەکوڕی سومەییە. ئەگەر هاوکاریان ناکەن، سوێندتان دەدەم بەخوا، کوشتاریان مەکەن. ئەم پیاوە بەکوڕە مامەکەی یەزید کوڕی معاویە بسپێرت چونکە بەگیانی خۆم یەزید لەفەرمانبەری ئێوە بەکارێك کەمتر لەکوشتنی حسین رازی دەبێت. شیمر تیرێکی بۆ هاویشت و وتی: بێدەنگ بە خوا دەنگت ببڕێت! ئێمەت بەوتەکانت بێزار کرد. زوهەیر وتی: ئەی کوڕی ئەو پیاوەی میزی بەپاژنەی خۆیدا دەکرد! من قسە لەگەڵ تۆ مناکەم چونکە تۆ ئاژەڵێك زیاتر نیت. سوێند بەخوا گومان ناکەم بتوانی تەنانەت دو ئایە لەقورئان بخوێنیتەوە. مژدەت لێ بێت بۆ ریسوایی رۆژی هەستانەوە و ئەشکەنجە ئازاردەرەکانی دۆزەخ. شیمر وتی: ئەوەندە ناخایەنێت کەخواوەند تۆ و گەورەکەت دەکوژێت. زوهەیر وتی: ئایا لەمەرگ دەمترسێنیت؟ سوێند بەخوا کوژران لەم ساتەدا لای من زۆر خۆشەویستترە لەنەمری لەگەڵ ئێوەدا! دواتر دەنگی خۆی بەرز کردەوە و وتی: ئەی بەندەکانی خوا، رێگە مەدەن ئەم کەسە هیچ و پوچە ئێوە لەئایینەکەتان دور بخاتەوە. سوێند بەخوا ئابڕیوانی محەممەد بەکەسێك ناگات کەخوێنی منداڵەکانی ئەو بڕێژێت و ئەو کەسانە کوشتار بکات کە هاوکاری خەڵك دەکەن و دەیانپارێزن و بەرگری لەپێگەی کۆمەڵانی خەڵك دەکەن. حسین فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە.

کاتێك عومەر کوڕی سەعد پێشڕەوی خۆی بۆ لای حسین دەست پێکرد، حوڕ کوڕی

یەزید هاتە لای و وتی: خوا بتبەخشێت، ئایا شەڕ لەگەڵ ئەم پیاوە دەکەیت؟ وتی: بەڵێ. شەڕێك كە ئاسانترینەکەی پەڕینی دەست و سەرەکان بێت. حوڕ وتی: ئایا لەو پێشنیارانەی بەنێوەی کرد، بەهیچ کامیان رازی نەبون؟ عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەدەستی مندا دەبو، رازی دەبوم بەڵام فەرمانڕەوەکەی تۆ رازی نەبو. ئەو بەرێکەوت و هێواش هێواش خۆی لەحسین کوڕی عەلی نزیك کردەوە. دڵدان بۆ کوژران شان بەشانی حسین ئەوی پەرێشان کردبو بەشێوەیەك لە خۆشحاڵی دەلەرزا. پیاوێك لەبنەماڵەکەی بەناوی موهاجیر کوڕی ئەوسی تەمیمی پێی وت: سوێند بەخوا ئەم کارەی تۆ هۆکاری گومانە! هەرگیز تۆم لەپێگەیەکی هاوشێوەی ئەمە نەبینیوە. ئەگەر دەیانپرسی بوێرترین کەسی کوفە کێیە، سوێند بەخوا چاوم لەتۆ نەدەپۆشی. حوڕ وتی: سوێند بەخوا خۆم لەسەر دوڕیانی بەهەشت و جەهەننەم دەبینم. بەڵام ناتوانم چاو لەبەهەشت بپۆشم ئەگەرچی بمکوژن و لەت لەتم بکەن و بمسوتێنن. سوار ئەسپەکەی بو و پەیوەستی حسین کوڕی عەلی بو. حوڕ پێی وت: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا، خوا بمکاتە قوربانی تۆ. من ئەو هاوڕێی تۆم رێگەی گەڕانەوەم لێگرتی و لەسەرڕاسەری رێگە شان بەشانی تۆ رێگام بڕی و تۆم خستە ئەم تەنگانەوە. سوێند بەخوا هەرگیز گومانم نەدەکرد ئەم خەڵکە بەپێشنیارەکانی تۆ رازی نەبن. هەرگیز گومانم نەدەکرد ئەم بەڵایەت بەسەردابێت. بەخۆم وت: ترسم نیە ئەگەر لەهەندێ کار هاوکاری ئەم خەڵکە بکەم تا گومان نەکەم فەرمانەکانی ئەوان جێبەجێ ناکەم. گومانم دەکرد بەدەستەیەك لەپێشنیارەکانی تۆ رازی ببن. ئەگەر دەمزانی کەرازی نابن، هیچ کات ئەو هەڵس و کەوتەم لەگەڵ تۆ نەدەکرد. من پەنام بۆ تۆ هێناوە ولەوەی کردومە، پەشیمانم وگیانم دەکەمە قوربانی تۆ تا شان بەشانی تۆ بکوژرێم و گیان ببەخشم. ئایا هیچ رێگەیەکی گەڕانەوە بۆ لای خوا بۆ من دەبینیت؟ حسین وتی: بەڵێ، خوا بەتۆی دەبەخشێت و لێت خۆش دەبێت.

حوڕ بۆ لای هاوڕێکانی خۆی گەڕایەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، ئایا بەیەکێك لەپێشنیارەکانی حسین رازی نابن؟ ئایا ناخوازن خوا ئێوە لەشەڕی ئەو دور بخاتەوە؟ عومەر کوڕی سەعد وتی: زۆرم حەز دەکرد، ئەگەر رێگەچارەیەك هەبوایە. حوڕ وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت و بەردەوام چاویان بۆ لەدەستدانی

ئێوە فرمێسکاوی بێت! ئایا بانگتان کرد و کاتێك هات، لەدەوری ئەو بڵاوەتان لێکرد؟ گومانتان دەکرد لەرێگای ئەودا گیان دەبەخشن و دواتر هێرشتان کردە سەر تا بیکوژن؟ گەمارۆتان خستە سەر و لەهەر لایێکەوە دەورتان گرت و لەرۆشتن بۆ سەرزەمینی بەربلاوی خوا رێگریتان لێکرد و رێگەتان نەدا خۆی و بنەماڵەکەی بەئاسودەیی ژیان بەسەر ببەن. ئێستا وەك ئەسیرێك گرفتاری ئێوە بوە بەشێوەیەك نەدەتوانێت سودێك بەخۆی ببەخشێت ونەدەتوانێت زیانێك لەخۆی دور بخاتەوە. رێگەی ئاوتان لەخۆی و هاورێکانی گرت لەگەڵ ئەوەی جولەکە و ئاگرپەرەست و مەسیحی لێی دەخۆنەوە و ورچ و سەگەکانی سواد مەلەی تیا دەکەن و ئێستا کە ئەو بوێر و پیاو و ئابڕوداره، هاورێ لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکەی لەتینواندا خەریکە دەمرێت! قێزەونە ئەو کردارەی دوای محەممەد لەگەڵ بنەماڵەکەی ئەو کردتان! خواوەند لەرۆژی تینویەتی ئاوتان پێ نەدات ئەگەر بۆ لای خوا نەگەرێنەوە و دەست لەم کارەتان هەڵنەگرن! ئەوان تیربارانیان کرد و ئەو گەرایەوە و لەبەردەم حسین کوڕی عەلی وەستا.

لەم کاتەدا عومەر کوڕی سەعد ئاڵاکەی خۆی بۆ پێشەوە دەبرد و تیرێکی هەڵگرت و هاویشتی و وتی: شایەتی دەدەن کە من یەکەم تیرهاوێژ بوم! دواتر خەڵك تیربارانیان دەست پێکرد. یەسار کۆیلەی زیاد کوڕی ئوبیە و سالم کۆیلەی عوبەیدالله کوڕی زیاد هاتنەدەر و داوای شەڕکەریان کرد. عەبدالله کوڕی عومەیری کەلبی روبەرویان بویەوە. ئەو هاورێ لەگەڵ ژنەکەی لەکوفەوە بۆ هاوکاری حسین کوڕی عەلی هاتبو. ئەو دو کۆیلە پێیان وت: کێیت؟ ئەژادی خۆی پێ وتن. ئەو دوانە وتیان: ئێمە تۆ ناناسین، دەبێت زوهەیر کوڕی قین یا حەبیب کوڕی موتەهەر یا بەربەرین کوڕی خوزەیر شەڕ لەگەڵ ئێمە بکەن. یەسار لەپێش سالەوە بو. عەبدالله پێی وت: کوڕی ژنی لەشفرۆش! تۆ دەتوانی پشت بکەیتە شەڕ کردن لەگەڵ کەسێك! کەس روبەروی تۆ نابێتەوە مەگەر ئەوەی باشتر لەتۆ بێت. دواتر بەشمشێرەکەی هێرشی کردە سەر و بەشێوەیەك لێیدا کەسست بو. شەڕی دەست پێکرد و بەردەوام لێی دەدا. سالم هێرشی کردە سەر بەڵام عەبدالله گرنگی پێنەدا تا ئەوی گرت و لێیدا. عەبدالله دەستی چەپی کردە قەڵغانی خۆی و پەنجەکانی قرتان. دواتر عەبدالله کەلبی روی تێکرد و لێیدا و کوشتی. ژنەکەی بەناوی دایکی وەهب گورزێکی هەڵگرت و بەرەو لای مێردەکەی رۆشت و بەردەوام

دەیوت: دایك و باوكم بەقوربانت بن. بۆ پارێزگاری كردن لەبنەماڵەی پێغەمبەر شەڕ بكە. مێردەكەی ئەوی بۆ لای ژنان گەڕاندەوە. ژن رازی نەبو و وتی: ناڕۆم تا شان بەشانی تۆ دەكوژرێم. حسین بانگی كرد: ئەی بنەماڵەی بەرێز، خوا باشترین پاداشتتان بداتەوە! بگەڕێرەوە ئەی ژن، خوا لێت خۆش بێت، شەڕ كردن بۆ ژنان پێویست نیە. ژن گەڕایەوە.

عەمرۆ كوڕی حەجاجی زوبەیدی هاوڕێ لەگەڵ باڵی راستی سوپاكەی عومەر كوڕی سەعد پێشڕەویان دەست پێكرد. كاتێك لەحسین نزیك كەوتنەوە، هاوڕێكانی كەوتنە سەر ئەژنۆ و رمەكانیان بەروی ئەواندا كردە نیشانە. سوارەكان گەڕانەوە و هاوەڵانی حسین ئەوانیان تیرباران كرد و چەندین كەس لەوانیان كوشت و دەستەیەكیتریان بریندار كرد.

پیاوێك لەوان بەناوی كوڕی حەوەزە هاتە پێش و وتی: ئایا حسین لەناو ئێوەدایە؟ كەس وەڵامی نەدایەوە. سێ جار قسەكەی هێنایە سەر زمان. وتیان: بەڵێ، حسین لەناو ئێمەدایە، چیت دەوێت؟ وتی: ئەی حسین مژدەت لێ بێت بۆ ئاگری دۆزەخ! حسین پێی وت: درۆت كرد، پەنا بۆخواوەندی مێهرەبان دەبەم، تۆ كێیت؟ وتی: كوڕی حەوەزە. حسین وتی: خوایە لەقوڵایی جەهەننەم جێگەی بكەرەوە! كوڕی حەوەزە توڕە بو وئەسپەكەی خۆی غاردا. ئەسپەكە رو لەروبارێك لەنێوان ئەم دوانە پەڕی و سوارەكە كەوتە خوار و قاچی لەزینەكە گیری كرد و بەئەسپەكەوە هەڵواسرا. ئەسپەكە چەند جارێك ئەوی كێشا بەدار و بەردەكاندا و لەئەنجامی ئەمەدا مرد.

مەسروق كوڕی وایلی حەزرەمی لەگەڵ ئەوان هاتبویە دەر و وتبوی كە: ئەگەری هەیە سەری حسین بەدەست بێنم و لەم رێگاوە پێگەكەم لای كوڕی زیاد بەرز ببێتەوە. كاتێك بینی بەهۆی دۆعاكەی حسین كوڕی عەلی چی بەسەر كوڕی حەوەزەدا هات، وتی: شتێكم لەم بنەماڵەیە بینی كە هیچ كات شەڕیان لەگەڵ ناكەم.

شەڕی لەنێوان دو سوپاكە دەستی پێكرد. یەزید كوڕی مەعقەل هاوپەیمانی عەبدقەیس هاتەدەر و هاواری كرد: ئای بەریر كوڕی خوزەیر، دەزانی خوا لەگەڵ تۆ چی كرد؟ بەریر وتی: سوێند بەخوا چاكەی لەگەڵ من كرد و خراپەی لەگەڵ تۆ. یەزید وتی: درۆت كرد و پێشتریش درۆزن بویت و شایەتی دەدەم لەگومڕاكانیت. بەریر وتی: ئایا

لەگەڵ لەسەر ئایینی نفرین کردن بەردەوام بین؟ خواوەند درۆزن نفرین بکات و گومڕا لەناو ببات. وەرە تا شەڕی دەستەویەخە تاقی بکەینەوە. هەردوکیان هاتنەدەر و ئایینی نفرین کردنیان جێبەجێ کرد کە خوا درۆزن نفرین بکات و گومڕا لەناو ببات. دواتر پەلاماری یەکیاندا و یەکی دو زەربەیان لەیەکدا. یەزید کوڕی مەعقەل، لەبەریر کوڕی خوزەیریدا بەڵام زیانی پێنەگەیاند. کوڕی خوزەیر لەویدا کە ناوچاوی قڵیشت و شمشێرەکە بەمێشکی گەیشت. کەوتە سەر زەوی و شمشێرەکە لەسەریدا بو. رەزی کوڕی مونقیزی عەبدی هێرشی کردەسەر و پەلاماری کوڕی خوزەیریدا. ماوەیەك لەیەکتریاندا و سەرئەنجام کوڕی خوزەیر ئەوی گرت و لەسەر سینەی دانیشت. کەعب کوڕی جابری ئەزدی بەرِم هێرشی کردە سەر و لەپشتەوە نوکی ڕمەکەی لەپشتی چەقاند. کاتێك هەستی بەئازاری ڕمەکە کرد لەسەر سکی رەزی هەستا و گازی لەلوتی گرت و بەشێك لەجەستەی هەڵدڕی. کەعب کوڕی جابر بەشمشێر لێیدا و کوشتی. رەزی هەستا و تەپ و تۆزی لەخۆی دەتەکاند. کاتێك کەعب کوڕی جابر بۆماڵەوە گەڕایەوە، ژنەکەی پێی وت: لەزیانی کوڕی فاتیمە شەڕت کرد و بەریر سەروەری قورئان خوێنەکانت کوشت. سوێند بەخوا هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

عەمرۆ کوڕی قەرەزەی ئەنساری هاتەدەر و لەبەردەم حسین شەڕی کرد و کوژرا. براکەی لەناو سوپاکەی عومەر کوڕی سەعددابو. هاواری کرد: ئەی حسین، ئای درۆزنی درۆزن زادە، براکەمت فریودا تا کوژرا. حسین وتی: خوا براکەتی گومڕا نەکرد بەڵکو ڕێنوێیی کرد و تۆی گومڕا کرد. وتی: خوا بمکوژێت ئەگەر نەتکوژم یا لەم ڕێگادا نەکوژرێم. ئەو هێرشی هێنا و نافیع کوڕی هیلالی موڕادی روبەروی بویەوە و خستیە سەر زەوی. هاورێکانی هێرشیان هێنا و ئەویان رزگار کرد. دواتر چارەسەر کرا و باش بویەوە.

حوڕ کوڕی یەزید بۆ بەرگری کردن لەحسین بوێرانە شاەڕی کرد. یەزید کوڕی سوفیان روبەروی بویەوە کە حوڕ ئەوی کوشت. نافیك هیلال لەبەرژەوەندی حسین شەڕی کرد. موزاحیم کوڕی حورەیس روبەروی بویەوە کە نافیع ئەوی کوشت.

عەمرۆ کوڕی حەجاج بانگی خەڵکی کرد: ئایا دەزانن لەگەڵ کێ شەڕ دەکەن؟ سوارە شێرئاساکانی شارەکان. ئەو خەڵکانەی پشت دەکەنە گیان. کەس لەئێوە شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ ئەوان نەکات چونکە ژمارەیان کەمە و ماوەیەکی کەم دەتوانن

خۆراگری بکەن. سوێند بەخوا ئەگەر تەنیا بەردبارانیان بکەن، لەناویان دەبەن. ئەی خەڵکانی کوفە گوێرایەڵ و هاورێی خەڵك بن و لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەو کەسانەی لەدین هەڵگەڕانەوە و ڕێگەی ناسازگاریان گرتەبەر، گومانتان نەبێت. عومەر وتی: ئەمە بۆچونێکی ڕاستە. ئەو چیتر نەیهێشت خەڵك شەڕی دەستەویەخە بکەن. حسین دەنگی ئەوی بیست و وتی: ئەی عەمرۆ کوڕی حەجاج، ئایا خەڵك دژی من هان دەدەیت؟ ئێمە لەدین هەڵگەڕاینەوە یا ئێوە؟ سوێند بەخوا ئەگەر گیانمان لێ بستێنرێت و ڕۆحم بەرەو ئەو دنیا بڕوات، دەزانین لەناو ئێمەدا چ کەسێك لەدین هەڵگەڕاوەتەوە.

عەمرۆ کوڕی حەجاج لەلای فوراتەوە هێرشی کردە سەر سوپاکەی حسین و بۆ ماوەیەك شەڕیان کرد و موسلیم کوڕی عەوەسجەی ئەسەدی کوژرا. عەمرۆ گەڕایەوە و موسلیمی لەناو خاك و خوێندا بینی. هێشتا نیوە گیانێکی مابو. حسین هاتە سەر سەری و وتی: ئەی موسلیم کوڕی عەوەسجە، خوا لێت خۆش بێت. دەستەیەك لەوان کوژران و ئەوانیتر چاوەڕوانی مەرگیان دەکرد (ئەحزاب/٢٣/٣٣) حەبیب کوڕی موتەهەر لێی نزیك کەوتەوە و وتی: کوژرانی تۆ لای من دژوارە، مژدەی بەهەشتت لێ بێت. ئەگەر دەمزانی بەدوای تۆدا ناکوژرێم، ئارەزوم دەکرد وەسیەتی خۆت لای من بکەیت تا ئەوەی پێویستە، ئەنجامی بدەم. وتی: پێشنیاری ئەم پیاوەت پێ دەکەم (نیشارەی بۆ حسین کرد). خوا لێت خۆش بێت. موسلیم مرد. کەنیزەکەی ئەو شین و ڕۆڕۆی دەست پێکرد و وتی: ئەی کوڕی عەوەسجە، هاورێیانی عومەر هاواریان کرد: موسلیممان کوشت. شەبس کوڕی ڕیبعی بەیەکێك لەکەسانی دەوروبەری خۆی وت: دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت، خۆتان بەدەستی خۆتان دەکوژن و لای کەسانیتر خۆتان ریسوا دەکەن. ئایا لەکوژرانی کەسێکی وەك موسلیم شادمانی دەکەن؟ سوێند بەو کەسەی بۆ ئەو باوەڕم بەئیسلام هێنا، چەندە کاری درەوشاوە و دەرخشان کە لەشەڕی موسوڵمانان لەوم بینی. ئەوم لەشەڕەکانی (سەلەقی ئازەربایەجان) بینی کە پێش خەوتنی سوارەکانی موسوڵمانان شەش کەس لەدوژمنانی کوشت. ئایا کەسێکی وەك ئەو دەکوژرێت و ئێوە شادمانی دەکەن؟

ئەو کەسانەی ئەویان کوشت دو کەس بون بەناوەکانی موسلیم کوڕی عەبدالله زیابی و عەبدلرەحمان کوڕی ئەبی خوشکارەی بەجلی.

شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن هاورێ لەگەڵ باڵی ڕاستی سوپاکەی عومەر هێرشی دەست

پێکرد و هاوڕێیانی حسین پیاوانە خۆڕاگریان کرد. ئەوان لەهەر لایەکەوە هێرشیان کردە سەر حسین و هاوڕێکانی. کەلبی کوژرا. ئەو پێش کوژران، دو پیاو جیاواز لەدوپیاوەکەی پێشوی کوشت و بەئازایەتی شەڕی کرد. هانی کوڕی سوبیتی حەزرەمی و بەکیر کوڕی حەی تیمی لەتیم الله کوڕی سەعلەبە ئەویان کوشت. هاوڕێیانی حسین تا ئەو شوێنەی دەیانتوانی شەڕیان کرد. سی و دو سوارە بون. هێرشیان دەکردە سەر هەر لەشکرێك لەخەڵکانی کوفە، کەڵێنیان تیا دروست دەکرد و لەبەرابەر ئەوان ڕەمیان دەکرد. کاتێك عەزرە کوڕی قەیس، فەرماندەی سوارەکانی کوفە ئەمەی بینی، کەسێکی بۆ لای عومەر رەوانە کرد و پەیامیدا کە: ئایا نابینی سوارەکانی من ئەمڕۆ لەدەست ئەم سوپاکەمە چییان بەسەر دێت؟ پیادە و تیرهاوێژەکان رەوانە بکە. بەشەبس کوڕی ڕێبعی وت: ئایا هێرش ناکەیتە سەر ئەوان! وتی: پەنا بەخوا! پیری موزێر و ڕێبەری هەمو شارەکان! ئەو بۆ تیر هاویشتن دەست نیشان دەکەیت! کەست جگە لەمن بۆ ئەم کارە نەبینی! بەردەوام دەیانبینی شەبس لەم شەڕە ناڕازیە. تەنانەت لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەسعەب بەردەوام دەیوت: خەڵکی ئەم شارە هەرگیز باشی نابینن وهەرگیز ناگەنە سەر ڕێگای ڕاست. ئایا سەیرنیە ئێمە شان بەشانی عەلی کوڕی ئەبی تالب بۆ ماوەی پێنج ساڵ شەڕمان کرد و دواتر هێرشمان کردە سەر کوڕەکەی کە یەکێك لەباشترین پیاوانی سەر زەوی بو. لەبەرژەوەندی کوڕی سومەیە و بنەماڵەی معاویە شەڕی بنەماڵەی پێغەمبەرمان کرد. ئەمە گومڕاییە، چ گومڕاییەکی مەترسیدار!

کاتێك شەبس ڕێبعی ئەمەی وت، عومەر کوڕی سەعد، حوصەین کوڕی ئەمیری بانگ کرد و هاوڕێ لەگەڵ ئەو پیاوە زرێپۆشەکانی سوار لەسەر ئەسپەکان هاوڕێ لەگەڵ پێنسەد تیر هاوێژ رەوانە کرد. کاتێك لەحسین و هاوڕێکانی نزیك کەوتنەوە، ئەوانیان تیرباران کرد. زۆری نەخایاند هەمو ئەسپەکانی ئەوان کوژران و ناچار دابەزین. حور کوڕی یەزید پیادە بەو پەڕی ئازایەتی شەڕی دەکرد. تا نیمەڕۆ شەڕیان لەگەڵ ئەوان کرد. دژوارترین شەڕێك بو خوا تا ئەو ڕۆژە ئافراندبوی. چونکە خێوەتی حسین و کەسانیتر بەیەکەوە گرێدرابون، سوپاکەی عومەری کوڕی سەعد نەیاندەتوانی لەیەك قۆڵ زیاتر شەڕیان لەگەڵ بکەن. کاتێك عومەر ئەمەی بینی، چەندین کەسی رەوانە کرد تا خێوەتەکان لەچەپ و ڕاستەوە لەناو ببەن تا بتوانن گەمارۆیان بخەنەسەر. شەڕەکە

بەرادەیەك دژوار بو كە سێ یا چوار شەڕكەری حسین كوڕی عەلی لەناو ماڵەكاندا دەگەڕان و پیاوێك كە خێوەتەكانی لەیەك دەكردەوە، دەیانگرت و دەیانكوشت و تاڵانیان دەكرد و لەنزیكەوە تیربارانیان دەكرد یا لەئەسپەكەی دەیانهێنایە خوار. عومەری سەعد فەرمانیدا و گڕیان لەخێوەتەكان بەردا. حسین بەهاوڕێكانی خۆی وت: ڕێگە بدەن خێوەتەكان بسوتێنن چونكە كاتێك ئاگریان تێبەردا ناتوانن لەوێوە خۆیان بەئێوە بگەیێنن. بارودۆخ بەو شێوە بو كە حسین پێشبینی كرد.

ژنی كەلابی هاتەدەر و لەسەر سەری مێردەكەی دانیشت و سەری ئەوی خستە سەرداوێن و تەپ و تۆزی لەروخساری تەكاند و وتی: ئەی هاوڕێ، بەهەشت نۆشی گیانت بێت. شیمر فەرمانی بەكۆیلەكەی خۆی پانی ڕۆستەم دا كە هات و گورزێكی قورسی كێشا بەسەری ئەو ژنەدا كە دەستبەجێ گیانی سپارد.

شیمر كوڕی زی ئەلجەوشەن بەرێكەوت و خۆی گەیاندە خێوەتەكانی حسین و هاواری كرد: ئاگرم بۆ بێنم تا ئەم خێوەتە بەسەر كەسەكانی ناویدا بسوتێنم. ژنان هاواریان كرد و رایان كردە دەر. حسین وتی: تۆ دەتەوێت خێوەتەكان بەسەر ماڵ و منالەكەی مندا بسوتێنیت؟ خوا بەئاگری دۆزخ بتسوتێنێت. حومەید كوڕی موسلیم بەشیمری وت: ئەم كارە راست نیە كە لەسەر شێوەی خوا ئەشكەنجە بكەیت ( ئەشكەنجە بەئاگر تایبەتە بەخوا و تۆ ئەو كارە بكەیت) و منال و ژنان كوشتار بكەیت. سوێند بەخوا تەنیا كوشتنی پیاوان فەرماندارەكەی تۆ رازی دەكات! ئەو رازی نەبو. شەبس كوڕی ڕێبعی هات و ڕێگەی ئەم كارەی لێگرت و شیمر رازی بو. شیمر مەبەستی ئەوەی كرد بگەڕێتەوە و لەم كاتەدا زوهەیر كوڕی قین هاوڕێ لەگەڵ دەكەس لەهاوڕێكانی هێرشیان كردە سەر. ئەوان باوكی عێزەی زابی لەهاوەڵانی شیمریان كوشت و ئەوانیان لەخێوەتەكان دور خستەوە. سوپاكەی عومەر هێرشیان كردنەسەر و زیاتر لەمان بون. كاتێك یەك یا دو كەس لەهاوەڵانی حسین دەكوژران، دواهاتەكانی دەردەكەوت چونكە ژمارەیان كەم بو بەڵام كاتێك لەسوپاكەی عومەر كەسانێك دەكوژران، دواهاتەكانی مەترسیدار نەبون چونكە ژمارەكەیان فراوان بو.

كاتێك، كاتی نوێژ هات، ئەبو سەمامە سایدی بەحسینی وت: گیانم قوربانت بێت، دەبینم كە ئەمانە لەتۆ نزیك بونەتەوە. تۆ ناكوژن مەگەر ئەوەی من لەم ڕێگادا بكوژرێم.

دەمەوێت ئەو کاتە چاوم بەخوا بکەوێت ئەم نوێژمیشم خوێندبێت. حسین وتی: بیری نوێژ کەوتیتەوە، خوا بەردەوام بیری نوێژکەران دەکاتەوە. بەلاّم ئێستا لەسەرەتای ئەو رێگەداین. دواتر وتی: داوایان لێبکەن دەست لەئێمە هەڵبگرن تا نوێژ بخوێنین. ئەو کارەیان کرد. حوصەین وتی: نوێژەکەتان قبولّ ناکرێت (یا ئەوەی ئێمە رازی نابین) حەبیب کوڕی موتەهەر پێی وت: گومان دەکەیت خواوەند بەنوێژی بنەماڵەی پێغەمبەر رازی نابێت و بەنوێژی تۆی کەر رازی دەبێت! حوصەین هێرشی کردەسەر. حەبیب روبەروی بویەوە و شمشێری لەروخساری ئەسپەکەیدا و سوارەکەی کەوتە خوار. هاورێیانی حوصیەن هەڵیانگرت و لەدەست حەبیب رزگاریان کرد. حەبیب شەڕی کرد و پیاوێکی لەلەبەنی تەمیم بەناوی بودەیل کوڕی صورەیم کوشت. پیاوێکیتر لەبەنی تەمیم هێرشی کردە سەر و بەڕم لێیدا و کەوتە سەر زەوی. حەبیب ویستی هەستێت کەحوصەین شمشێری لەسەریدا و پیاوێکی تەمیمی لەئەسپەکەی دابەزی و سەری بڕی. حوصەین وتی: لەکوشتنی ئەو لەگەڵ تۆدا شەریکم. ئەویتر وتی: سوێند بەخوا شەریك نیت. حوصەین وتی: سەری حەبیب بەمن بدە تا بەکلکی ئەسپەکەمەوە.هەڵیواسم تا خەڵك بزانن لەکوشتنی ئەودا شەریکی تۆم. دواتر دەیگەرێنمەوە و بیبە بۆ لای کوڕی زیاد کە ئەوەی بەتۆی دەدەن، پێویستم پێی نیە، ..

ئەو ئەم کارەی کرد و سەری حەبیبی لەناو خەڵکدا سوڕاند و دواتر بۆی گەڕاندەوە. کاتێك گەیشتنە کوفە، سەری براوی حەبیبی هەڵگرت و بەملی ئەسپەکەیەوە هەڵیواسی و روی کردە کۆشکی کوڕی زیاد. قاسم کوڕی حەبیب ئەوی بینی و روخساری لەزەمینیدا هەڵگرت. ئەو کوڕە گەیشتۆتە تەمەنی ئەوجەوانی. لای سوارەکە بەرێگادا دەڕۆشت و لێی جیا نەدەبویەوە. پیاوەکە گومانی لا دروست بو و پرسیاری لێکرد. قاسم پێی وت: ئەوە سەری باوکی منە. داوای سەری باوکی کرد تا بەخاکی بسپێرێت. پیاو وتی: فەرماندار رێگە نادات بەخاکی بسپێریت و جیاواز لەوە من دەمەوێت پاداشتی پێ وەربگرم. کوڕەکە وتی: بەلاّم خوا خراپترین پاداشت بەتۆ دەدات. کوڕ بەردەوام بەدوای بکوژەکەی باوکیدا دەڕۆشت تا ئەوەی لەدەرفەتێکدا بەسەریدا زالّ بێت و بیکوژێت. رۆژگاری مەصعەب کوڕی زوبەیر گەیشت و ئەو ڕۆشتە شەڕی جومەیرا و قاسم کوڕی حەبیب کوڕی موتەهەر ڕۆشتە ناو سوپاکەی ئەو. بینی کە بکوژەکەی باوکی لەخێوەتەکەی خۆی

دانیشتوە. لەکاتی نیمەڕۆ ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی و دەست بەجێ سەری بڕی.
کاتێك حەبیب کوژرا، حسین بەتەواوی دڵشکاو بو، وەك بڵێی خەم پشتی شکاند. لەم کاتەدا بو کەوتی: لەناوچونی گیانی خۆم و هاوڕێکانم بەخوا دەسپێرم. حوڕ کوڕی یەزید و زوهەیر کوڕی قین هێرشیان دەست پێکرد و بەسەختی شەڕیان کرد. یەکێك لەوان هێرشی دەست پێدەکرد و دەڕۆشتە قوڵای سوپاکەی عومەر، ئەوەیتر بەدوایدا دەڕۆشت تا لەو گێژاوە ڕزگاری بکات. دواتر پیادەکان هێرشیان کردە سەر حوڕ و ئەویان کوشت. ئەبو سەمامە سایدی کوڕە مامەکەی خۆی کوشت کە لەناو سوپاکەی دوژمندا بو. دواتر نوێژی نیمەڕۆیان خوێند و حسین لەگەڵ هاوەڵانی نوێژی (ترسی) خوێند. دوای نیمەڕۆ شەڕیان کرد و شەڕەکە بەرەو دژواری ڕۆشت. ئەوان گەیشتنە حسین. لەکاتی نوێژ پیاوێك بەناوی حەنەفی لەبەرابەر تیربارانی دوژمن خۆی کردە قەڵغانی حسین کەتیربارانیان کرد بەڵام بەهەمان شێوە لەبەردەم حسیندا بو تا کەوتە سەر زەوی.
زوهەیر کوڕی قین بەسەختی شەڕی کرد و کەسیر کوڕی عەبدالله شەعبی و موهاجیر کوڕی ئەوس هێرشیان کردە سەر و ئەویان کوشت. نافیع کوڕی هیلالی جومەلی لەهاوەڵانی حسین کوڕی عەلی، ناوی خۆی لەسەر تیرەکان نوسیبو. تیرەکانی ژەهراوی بون. دوانزە کەسی کوشت و دەستەیەکی بریندار کرد. ئەویان بەئەسیری گرت. ئەوەندەیان لێدا تا بازویان شکاند. شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن هەڵیگرت و بردی بۆ لای عومەر کوڕی سەعد. خوێن لەروخساری دەباری و بەردەوام دەیوت: دوانزە کەسم لەئێوە کوشت و دەستەیەکیشم بریندار کرد. ئەگەر دەست و بازوتان نەدەشکاندم، نەتاندەتوانی گرفتارم بکەن. شیمر شمشێری دەرکێشا تا بیکوژێت. نافیع کوڕی هیلال پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر موسوڵمان دەبویت، بۆت دژوار دەبو دەستت خوێناوی بەخوێنی ئێمە، بڕۆیتە دیداری خواوەند. سوپاس بۆ خوا کەکوشتنی ئێمەی لەسەر دەستی خراپترین نافرێنراوەکانی ئەنجام دەدا. شیمر ئەوی کوشت و دواتر هێرشی کردە سەر هاوەڵانی حسین.
کاتێك بینیان دوژمنان زۆر و ناتوانن پارێزگاری لەحسین یا بەرگری لەخۆیان بکەن، هەموان هەوڵیان دەدا پێش بکەون و لەبەردەم ئەو بکوژرێن. هەر کەس هەوڵی دەدا پێش ئەویتر گیانی ببەخشێت. عەبدالله کوڕی عەزوەدە و عەبدولرەحمان کوڕی

عەزوەدە، هەردوك لەغەفاریەکان، هاتنە لای حسین و وتیان: خەڵکان ئێمەیان بۆ لای تۆ هێنا. ئەو دوانە لەبەردەم حسین شەڕیان کرد. دو گەنجی جابری: سەیف کوڕی حارس کوڕی سەریع و مالك کوڕی عەبد کوڕی سەریع کە کوڕە مام و لەدایکەوە برای یەکتر بون هاتنە لای حسین و بەکوڵ گریان. حسین وتی: بۆ بەم شێوەیە دەگرین؟ هیوادارم کەمێکیتر چاوەکانتان روناك ببێتەوە. هەردوك وتیان: سوێند بەخوا ترسمان نیە و بۆ خۆمان ناگرین. لەبەر ئەوە دەگرین کە دەبینین ئەوان لەهەمو لایەکەوە گەمارۆیان داویت و ناتوانین پارێزگاریت لێ بکەین. حسین وتی: خوا باشترین پاداشتی هەردوکتان بداتەوە.

حەنزەلە کوڕی ئەسعەدی شەبامی هات و لەبەردەم حسین کوڕی عەلی وەستا و هاواری کرد: ئەی خەڵکانی من، من بۆ ئێوە، لەرۆژێکی ڕەش دەترسم کە هاوشێوەی رۆژگاری ئەو دەستە لەخەڵکان بێت. چارەنوسی هاوشێوەی خەڵکانی عاد و نوح و سەمود و ئەو کەسانەی بەدوای ئەواندا هاتن. چونکە خوا نایەوێت ستەم لەبەندەکانی خۆی بکات. ئەی خەڵکانی من، بۆ ئێوە، لەرۆژی هەستانەوە دەترسم کە خەڵك لەترسی ئاگری دۆزەخ بەردەوام یەکتر بانگ دەکەن. ئەو رۆژەی پشتی تێدەکەن و هەڵدێن و خوا پارێزەر لەئێوە درێغ دەکات، ئەو کەسانەی خوا گومڕایان بکات، هیچ ڕێنوێنیەکیان بۆ نیە (غافر/٤٠/٣٠—٣٣) ئەی خەڵکینە، حسین مەکوژن تا خوا ئێوە بەئەشکەنجە نەکوژێت. و بەدبەخت و چارەڕەش ئەو کەسەیە درۆ بۆ خوا هەڵبەستێت (طە /٢٠/٦١) حسین پێی وت: خوا لێت خۆش بێت، ئەوان شیاوی ئەشکەنجەن چونکە بەوەی پێشنیارم کرد رازی نەبون و پشتیان کردە راستی و دروستی و مەبەستی ئەومیان کرد تا تۆ و هاوەڵانت لەناو ببەن. برا پاك و پاك نەژادەکانی تۆیان کوشت. ئەو سڵاوی بۆ حسین و بنەماڵەکەی نارد و شەڕی کرد تا کوژرا.

دو گەنجە جابریەکە هاتنە پێش و ماڵئاواییان لەحسین کرد و شەڕیان کرد تا کوژران.

عابس کوڕی ئەبی شەبیبی شاکری و شەوەزەب کۆیلەی شاکر هاتنە لای حسین و سڵاویان لێکرد و دواتر پێشڕەویان دەست پێکرد و شەڕیان کرد تا شەوەزەب کوژرا. عابس داوای شەڕکەری کرد و خەڵك لەترسا کشانەوە و کەس بۆ شەڕی ئەو نەهاتەدەر. عومەر کوڕی سەعد وتی: بەردبارانی بکەن. لەهەر لایەکەوە بەردبارانیان کرد. کاتێك ئەمەی بینی

زرێ و خودەکەی خۆی دەرهێنا و هێرشی کردە سەر خەڵکان و پاشەکشێی پێکردن. بەڵام گەڕانەوە و کوشتیان. دەستەیەك دەیانوت ئێمە کوشتومانە و هەر کەسێك دەیوت من کوشتومە.

زوحاك کوڕی عەبداللە مەشرەقی هاتە لای حسین و وتی: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا، دەزانی کە پێم وتی: تا ئەو کاتەی شەڕکەرێك لای تۆ بێت، شان بەشانی تۆ شەڕ دەکەم بەڵام ئەگەر شەڕکەر نەبینم، ئازادم کە بگەڕێمەوە. حسین وتی: ڕاستیت وت، بەڵام چۆن دەتوانی خۆت ڕزگار بکەیت؟ ئەگەر دەتوانی، ئازادی. دەڵێت: روم کردە ئەسپەکەی خۆم. ئەسپەکەم لە لەوەڕگەیەك بەرەڵا کردبو. پیادە شەڕم کرد و دو پیاوم کوشت و دەستی سێیەم کەسم قرتاند. دەڵێت: سوار ئەسپەکەی خۆم بوم و هێرشم کردە سەر قەراغەکانی دوژمن تا ڕێگەیان بۆ کردمەوە. پانزە کەس شوێنم کەوتن بەڵام رامکرد و لەدەستیان ڕزگارم بو.

ئەبو شەعسا کێندی (یەزید کوڕی ئەبی زیاد) لەبەردەم حسین کوڕی عەلی کەوتە سەر چۆك و یەك سەد تیری هاویشت کە تەنیا پێنج تیر کەوتە سەر زەوی و ئەویتر لەسینەی دوژمنان چەقی. هەرجار کە تیرێکی دەهاویشت، حسین دەیوت: خوایە تیرەکەی بەنیشانە بگەیێنە و پاداشتەکەی لەبەهەشت بدەرەوە. کوڕی یەزید لەو کەسانە بو کە لەگەڵ سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد هاتبوە دەر بەڵام کاتێك ئەوان بەپێشنیارەکانی حسین کوڕی عەلی رازی نەبون، پەیوەستی حسین بو و شەڕی دەست پێکرد و یەکەم کەس بو کوژرا.

بەڵام صەیداوی عەمرۆ کوڕی خالید و جەبار کوڕی حارسی سەلمانی و سەعد کۆیلەی عەمرۆ کوڕی خالید و موجەمەع کوڕی عوبەیداللەی عایزی، لەسەرەتاوە شەڕیان دەست پێکرد. کاتێك ڕۆشتنە ناو سوپای دوژمن، ئەوان گەمارۆیان دان و پەیوەندی ئەوانیان لەگەڵ هاورێکانیان پچڕاند. عەباس کوڕی عەلی هێرشی برد و ئەوانی بەبریندارى ڕزگار کرد. کاتێك دوژمن روبەرویان بویەوە، هێرشیان دەست پێکرد و هەمویان لەسەرەتای شەڕەکە لەیەك جێگەدا کوژران.

دوایین کەس لەهاوەڵانی حسین کەزیندو مایەوە، سوەید کوڕی ئەبی موتاعی خەسعەمی بو. یەکەم کەس لەبنەماڵەی ئەبو تالب کە لەو ڕۆژەدا کوژرا، عەلی کوڕی گەورەی حسین

کوڕی عەلی بو. دایکی لەیلا کچی ئەبو مورە کوڕی عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی بو.
ئەو هێرشی کردە سەر ئەو خەڵکەو وبەردەوام دەیوت:

انا علی بن حسین بن علی      نحن و رب و البیت اولی بالنبی

تالله لا یحکم فینا ابن الدعی

یانی: من عەلی کوڕی حسێن کوڕی عەلیم. سوێند بەخوای کەعبە، ئێمە بۆ پێگەی پێغەمبەر شیاوترین. سوێند بەرێزداری خوا، کە کوڕی ژنی لەش فرۆش فەرمانڕەوایەتی ئێمە ناکات.

چەندین جار ئەم کارەی دوبارە کردەوە. مورە کوڕی مونقیزی عەبدی پەلاماریدا و شمشێری لێدا و لەسەر سواریەکەی خستیە خوار. خەڵك ئەویان بەشمشێر لەت لەت کرد. کاتێك حسین ئەمەی بینی، وتی: خوا بیانکوژێت ئەوانەی تۆیان کوشت! کوڕم، ئەوان چۆن بۆ درینی رێزی پێغەمبەر بوێر بون! دوای تۆ قوڕ بەسەر ژیانی ئەم جیهانە! حسین لەگەڵ گەنجەکانی بەرەو لای جەستەکەی ڕۆشت و وتی: براکەتان هەڵگرن. ئەویان هەڵگرت و هێنایان و لەبەردەم ئەو خێوەتەی شەڕیان دەکرد، دایاننا.

دواتر عەمرۆ کوڕی صوبەیحی صودایی تیرێکی بۆ عەبدالله کوڕی موسلیم کوڕی عەقیل هاویشت کە گەنجەکە لەترسا دەستی خستە سەر ناوچاوانی بەلام نەیتوانی دەستی هەڵگرێت چونکە تیرەکەی دەستی ئەوی بەناوچاویەوە دوری. تیرێکی دیکەی بۆ هاویشت و ئەوی کوشت.

خەڵك لەهەر لایەکەوە هێرشیان دەست پێکرد. عەبدالله کوڕی قوتبەی تایی هێرشی کردە سەر عەون کوڕی عەبدالله کوڕی جەعفەر و ئەوی کوشت. عوسمان کوڕی خالید کوڕی ئوسەیری جوهەنی و بیشر کوڕی سوتی هەمەدانی هێرشیان کردەسەر عەبدولرەحمان کوڕی عەقیل و ئەویان کوشت. عەبدالله کوڕی عوروەی خەسعەمی تیری بۆ جەعفەر کوڕی عەقیل هاویشت و ئەوی کوشت. دواتر قاسم کوڕی حەسەن کوڕی عەلی شمشێر بەدەست هێرشی برد کە عەمرۆ کوڕی سەعد کوڕی نوفەیلی ئەزدی بەشمشێر لەسەریدا و قاسم کەوتە سەرزەوی و هاواری کرد: ئای مامە گیان، فریام کەوە! حسین بەرەو لای ڕۆشت و هێرشی کردە سەر عەمرۆ و بەشمشێر لەدەستیدا و قرتاندی. سوارانی کوفە هێرشیان کرد و عەمرۆیان رزگار کرد. بەئەسپەکانی خۆیان رویان کردە

ئەو گەنجە کە لەناو خوێنی خۆیدا دەتلایەوە و بەسمی ئەسپ کوتایان تا ئەوەی گیانی تەسلیم کرد. تۆزی گۆڕەپان دامرکایەوە و حسینیان بینی لەسەر ئەوجەوانێك وەستاوە و ئەو پاژنەکانی خۆی لەزەوی دەسوێت و حسین دەڵێت: لەخۆشەویستی خوا بەدور بن ئەو کەسانەی تۆیان کوشت، ئەو خەڵکانەی لەرۆژی هەستانەوە باوەگەورێی تۆ داوای خوێنی تۆیان لێدەکات. دواتر وتی: سوێند بەخوا بۆ مامی تۆ دژوارە بانگی بکەیت و نەتوانێت فریات بکەوێت یا بکات و گەیشتنەکەی هیچ سودێکی نەبێت. سوێند بەخوا، ئەمڕۆ، ئەو رۆژەیە کە خوێنخۆرانی ئەو فراوانن و هاورێیان کەم و ناتەوان! دواتر هەڵگیرت و لەئامێزی گرت و لای جەستەی منالەکەی خۆی عەلی گەورە و کوژراوانیتری بنەماڵەکەی داینا.

حسین کاتێکی درێژ لەرۆژ چاوەڕوانی کرد. هەرجار کە پیاوێك لەدوژمن ئاهەنگی گیانی ئەمی دەکرد، ترساو و لەرزان دەگەڕایەوە و دەترسا بیکوژێت و گوناحی خوێنی ئەو بگرێتە ئەستۆ. دواتر پیاوێك لەکێندە بەناوی مالك کوڕی نەسیر روبەروی بویەوە و شمشێری لەسەریدا و خودەکەی کرد بەدوکەرتەوە. خودەکە پڕبو لەخوێن. حسین وتی: هیچ کات بەو دەستەت نەخۆیت و نەخۆیتەوە تا خوا لەگەڵ ستەمکاران حەشرت بکات. کڵاوەکەی هەڵگرت و کردیە سەری. کێندی کڵاوەکەی هەڵگرت و بردیەوە بۆ بنەماڵەکەی و لەخوێن پاکی کردەوە. ژنەکەی وتی:جل و بەرگی کوڕی پێغەمبەری خوات هێناوە بۆ ماڵەکەی من؟ لێرە برۆ؟ ئەو پیاوە ئاوارە بو و کەوتە سواڵکردن و ژیانی لەبەدبەختی و رۆژگار رەشیدا بەسەر برد و گیانیدا.

حسین کورە بچوکەکەی هەڵگرت و لەداوێنی خۆی داینیشاند و دەیلاواندەوە. پیاوێك لەبەنی ئەسەد تیری بۆ هاویشت و قورگی منالەکەی دڕی. حسین دەستی خۆی لەخوێنی ئەو پڕ کرد و پرژاندی بەزەویدا و وتی: ئەی خوایە، ئەگەر هاوکاری ئاسمانت لەئێمە درێغ کردوە، با چاکەی ئێمەی بەدواوە بێت. خوایە تۆڵە لەم ستەمکارانە بستێنە.

عەبدالله کوڕی عەقەبەی غەنەوی تیرێکی بۆ ئەبوبەکر کوڕی حسین کوڕی عەلی هاویشت و ئەوی کوشت. عەباس کوڕی عەلی سێ براکەی خۆی لەدایکەوە بانگ کرد: عەبدالله و جەعفەر و عوسمان. بەوانی وت: هەنگاو بنە پێش تا میرات هەڵگری خوێنی ئێوە بم چونکە منالتان نیە و کەس نیە تۆڵەی ئێوە بستێنێتەوە. ئەوان بۆ پێشەوە

ڕۆیشتن و کوژران. لەم کاتەدا هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمی هێرشی کردە سەر عەبدالله کوڕی عەلی و ئەوی کوشت و دواتر هێرشی کردە سەر جەعفەر و ئەویشی کوشت. خەوەلی کوڕی یەزیدی ئەصبەحی هێرشی کردە سەر عوسمان کوڕی عەلی و لێیدا و دواتر پیاوێك لەبەنی ئوبان کوڕی دارم پەلاماریدا و کوشتی و سەری بڕی و لەگەڵ خۆیدا بردی. دواتر پیاوێك لەبەنی ئوبان هێرشی کردە سەر محەممەد کوڕی عەلی و ئەوی کوشت و سەرەکەی هەڵگرت.

دواتر مێردمنداڵێك لەناو خێوەتەکان هاتەدەر. دارێکی بەدەستەوە بو و ترساو سەیری ئەم لا و لای دەکرد. پیاوێك کەوترا هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمی بوە، هێرشی کردە سەر و کوشتی.

ئێستا حسین تینویەتی. خۆی گەیاندە روباری فورات و ویستی ئاو بخواتەوە. حوصەین کوڕی ئەمیر تیرێکی بۆ هاویشت کەبەردەمی کەوت و لێوانلێوی کرد لەخوێن. ئەو خوێنی دەمی بەدەست دەگرت و بەئاسمانیدا دەپرژاند. دواتر سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خوایە، گلەیی بۆ دەرگایی تۆ دەهێنم کەچیان بەسەر کوڕی پێغەمبەرەکەت هێنا. خوا یەك یەك ئەوان بژمێرە و هەموویان کوشتار بکە و هیچ کامیان بەزیندویی مەهێڵەرەوە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی تیرەکەی بۆ هاویشت، پیاوێك لەبەنی ئوبان کوڕی دارم بو. ئەو پیاوە دوای ماوەیەك ئەشکەنجەی خوایی بەسەریدا داباری. خوا گرفتاری تینویەتی کرد بەشێوەیەك هیچ کات تێر ئاو نەدەبو. بایان تێدەکرد و ساردیان دەکردەوە، ئاویان بۆ سارد دەکردەوە و تێکەڵ بەشەکریان دەکرد و قاپە گەورەکانیان پڕ دەکرد لەشیر و دەرخواردیان دەدا. دوبارە دەیوت، دەرخواردم بدەن خەریکە لەتینویەتیدا دەمرم. قاپێك یا گۆزەیەکیان پڕدەکرد و دەرخواردیان دەدا. کاتێك دەیخواردەوە، کەمێك ئارامی دەگرت و دواتر هەڵدەستایەوە و دەیوت: ئاوم پێ بدەن تینویەتی منی کوشت. زۆری نەخایاند سکی هاوشێوەی سکی وشتر ئاوسا و تەقا.

دواتر شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن لەگەڵ دەکەس لەپیاوانی خۆی روی کردە حسین و لەنێوان ئەو و خێوەتەکەی جیایی دروست کرد. حسین بەوانی وت: هاوار لەنێوە! ئەگەر دین و ئاییننتان نیە و لەرۆژی هەستانەوە ناترسن، جوامێریکی پاك نەژاد بن و کەسان و

بنەماڵەکەی من لەبەرابەر نەزانەکان بپارێزن. وتیان: ئەی کوڕی فاتیمە، بەم پێشنیارەت ڕازی دەبین. شیمر وپیادەکان هێرشیان کردە سەر کە ئەم کەسانە لەناویاندا بون: ئەبو ئەلجنوب عەبدولرەحمانی جوعفی، قەشعەم کوڕی نەزیری جوعفی، ساڵح کوڕی وەهبی یەزنی، سینان کوڕی ئەنسی نەخەعی و خەوەلی کوڕی یەزیدی ئەسبەحی. شیمر ئەوانی بۆ شەڕ لەگەڵ حسین هان دەدا و حسین هێرشی دەکردە سەر ئەوان. کوڕێکی ئەوجەوان لەناو بنەماڵەکەی هاتەدەر و لای ئەو وەستا. بەحر کوڕی کەعب کوڕی تیم الله بەشمشێر هێرشی کردە سەر حسین. کوڕ وتی: ئەی زادی ژنی خراپەکار! مامی منت کوشت! پیاوەکە شمشێری هێنایە خوار و کوڕەکە دەستی خۆی کردە قەڵغان و شمشێر دەستی بڕی بەشێوەیەك بەپێستەکەیەوە ئاوێزان بو. مناڵە ئەوجەوانەکە وتی: ئای دایە گیان، حسین هەڵگیرت و لەئامێزی گرت و وتی: کوڕی براکەم! بۆ ئەو بەڵای بەسەر تۆدا هاتوە، خۆڕاگر بە چونکە خوا بەم زوانە تۆ بۆ لای باوك و باوکە چاکەکارەکانت ڕەوانە دەکات: پێغەمبەر، عەلی، حەمزە، جەعفەر و حەسەن. دواتر حسین وتی: خوایە دڵۆپەکانی ئاسمان و پیرۆزیەکانی زەوی لەوان بستێنەرەوە. خوایە ئەگەر دەخوازیت تا ڕۆژگارێك دەرفەتیان پێ بدەیت، لەت لەتیان بکە و ئاشی بەربڵاوی بەردەوام بەسەر سەری ئەواندا بسوڕێنە و فوڕی داماوی فەرمانڕەواکانیان بکە بەسەردا و بەریسوایی بیانمرێنە. ئەوان بانگیان کردین تا هاوکاریمان بکەن و دواتر هێرشیان کردەسەرمان و کوشتاریان کردین.

دواتر هێرشی کردە سەر پیادەکان و بڵاوەی پێکردن. کاتێك حسین لەگەڵ سێ چوار کەس مایەوە، داوای پانتۆڵێکی کرد و دڕاندی و بڕی و کۆنی کرد و لەپێی کرد تا ڕوتی نەکەنەوە و نەیڕفێنن. پێیان وت: باشترە ئەگەر لەژێرەوە ژێر شەرواڵێەك لەپێ بکەیت. وتی: جلێکی نەشیاوە و بۆ من شیاو نیە لەپێی بکەم. کاتێك کوژرا، بەحر کوڕی کەعب ئەو پانتۆڵە کۆنەیشی لەپێدا داکەند. دواتر دەستەکانی بەڵایەکی بەسەرداهات کە لەزستاندا ئاوی لێ دەهاتە خوار و لەهاویندا وەك دار وشك دەبو. خەڵك لەچەپ و ڕاستەوە پەلاماریاندا. حسین هێرشی دەکردە سەر شەڕکەرانی لای ڕاست و دواتر هێرشی دەکردە سەر شەڕکەرانی لای چەپ. هەرگیز نەبینراوە کەسێکی داغدار کە کوڕ و مناڵ و هاورێکانی کوژرابێت، لەو بەهێزتر و بوێرتر و چالاکتر بێت.

لەم کاتەدا کە لەنێوان مەرگ و ژیان پەلەقاژەی دەکرد، زێنەب لەخێوەتی حسین کوڕی

عەلی هاتەدەر و بەردەوام دەیوت: ئای خۆزگا ئاسمان دەکەوتە سەر زەوی. روی کردە عومەر کوڕی سەعد کە لەو ناوەدا بو و وتی: ئەی عومەر، باوکی عەبداللەیان کوشت و تۆ سەیری ناکەیت؟ فرمێسك لەچاوەکانی عومەر هاتە خوار بەشێوەیەك ڕیشی تەڕ کرد و ناچار بو پشت بکاتە ئەو خاتونە.

حسین عابایەکی لەخەز لەبەردابو. دەستاری لەسەردا بو. ریشی بەوسمە ڕەنگ دەکرد. پیادە وەك سوارەیەکی ئازا پیاوانە شەڕی دەکرد. لەبارانی تیر پشتی نەدەلەرزی و لەهەر شوێنێك کەلێنێکی لەدژومندا دەبینی، هێرشی دەکردە سەر. هێرشی دەکردە سەر سواران و بەردەوام دەیوت: ئایا بۆ کوشتنی من یەکتانگرتوە؟ سوێند بەخوا دوای من هیچ بەندەیەك لەبەندەکانی خوا ناکوژن مەگەر ئەوەی کوشتنی ئەو زیاتر لەکوشتنی من تورەیی خوای لێبکەوێتەوە! هیوادرام خوا لەرێگەی ریسوا کردنی ئێوە دادی من وەربگرێت و لەشوێنێکدا گرفتارتان بکات کە چاوەڕوانی نەبن. هیوادرام خوا بەبێ ڕێز کردنی ئێوە من بەڕێز بکات. سوێند بەخوا ئەگەر بمکوژن، خوا زیان دەخاتە ناو ئێوە و بەردەوام خوێنتان لەسەر زەوی دەبێت و هیچ کات لەئێوە رازی نابێت تا ئەشکەنجەی ئێوە چەندین بەرابەر بکات.

دەڵێت: ماوەیەکی زۆر لەرۆژ چاوەڕوانی کرد. ئەگەر خەڵکان بیانویستایە بیکوژن، دەیانتوانی بەلاّم ئەوان لەترسی مەرگی ئەو پەنایان بۆ یەك دەبرد و هەموان کوشتنی ئەویان دەخستە ئەستۆی کەسانیتر. شیمر لەناو خەڵکدا هاواری کرد: لەم پیاوە چاوەڕوانی چین؟ بیکوژن، دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت. ئەوان هێرشیان کردە سەر. زورعە کوڕی شەریکی تەمیمی زەربەیەکی لەدەستی چەپی دا و یەکیتر زیانی بەشانی گەیاند. دواتر لەدەوری ئەو بلاّوەیان لێکرد. ئەو هەڵدەستا و دەکەوت. لەم کاتەدا سینان کوڕی ئەنسی ئەخەعی پەلاماریدا و ڕمێکی لێدا. حسین کەوتە سەر زەوی. ئەو بەخەولی کوڕی یەزیدی ئەسبەحی وت: سەری ببڕە. ویستی ئەو کارە بکات بەلاّم ترسا و گەڕایەوە. سینان پێی وت: خوا بازوەکانت لاواز بکات، دابەزی و سەری بڕی و تەسلیمی خەولی کرد. جل و بەرگەکانی هەموی تالاّن کرا. بەحر کوڕی کەعب پانتۆڵەکەی هەڵگرت. قەیس کوڕی ئەشعەس عاباکەی دزی. لەوەدا پێیان دەوت قەیسی عابادز. ئەسوەدی ئەودی پێلاّوەکانی لەپێ داکەند. پیاوێك لەدارم شمشێرەکەی هەڵگرت. خەڵك

ڕویان کردە مەڕو ماڵات و خێوەت و کەرەستەکان و هەمویان تالآن کرد. باروبنەی ئەو و زێر و زیوی ژنان و هاوسەران و هاوڕێیان و منداڵەکانی ئەویان رفاند. ئەم کارە بەردەوام تا ئەو جێگەی ژنێك بەقاوەقیژ لەخێوەتەکەی دەهاتەدەر وپیاوێك پەلاماریدەدا و جلەکانی لێ دەسەند.

جگە لەبرینی تیرەکان، لەسەر جەستەی حسین کوڕی عەلی شوێن برینی سی و سی ڕم و سی چوار شمشێر بینرا.

بەڵام سوەید کوڕی مەتاع، ئەو بریندار لەناو کوژراوەکان کەوت. بیستی کەدەڵێن: حسین کوژرا. ئەو کەمێك هەستی بەئارامی دەکرد. شمشێرەکەیان لێ سەندبو بەڵام کێردێکی پێ مابو. بەکێردەکەی خۆی ماوەیەك شەڕی لەگەڵ کردن و کوژرا. عوروە کوڕی بەتانی سەعلەبی و زەید کوڕی روقادی جونوبی ئەویان کوشت. دوایین کەس لەهاوەڵانی حسین بو کە کوژرا.

دواتر ئەوان هێرشیان کردە سەر خێوەتەکەی حسین و عەلی کوڕی حسین زەین ئەلعابدینیان بینی. شیمر ویستی بیکوژێت. حومەید کوڕی موسلیم پێی وت: پەنا بەخوا، منداڵەکان دەکوژن. ئەو نەخۆش بو. عومەر کوڕی سەعد هات و وتی: هیچ کەس بەهیچ جۆرێك هەنگاو نەنێتە ناو خێوەتی ژنان و کەس ئازاری ئەم منداڵە نەخۆشە نەدات. هەر کەس شتێکی لە کەڵ و پەلی کەسانیتر هەڵگرتوە، بیگەڕێنێتەوە. بەڵام کەس شتەکانی نەگەڕاندەوە. خەڵك بەسینان کوڕی ئەنسی نەخەعیان وت:حسین کوڕی عەلی کوڕی فاتیمە کچی پێغەمبەرت کوشت. ڕێزدارترین پیاوی عەرەبت سەر بڕی. ئەو مەبەستی ئەوەی کردبو فەرمانڕەوایی ئەم خراپەکارانە لەسەر زەوی نەهێڵێت. بڕۆ لای فەرماندەکان و فەرمانڕەواکان و داوای پاداشتیان لێ بکە چونکە ئەگەر داوای هەمو سامانەکەیان بکەیت، لەبەرابەر ئەم کارەی تۆ کەمە. ئەو سوار ئەسپەکەی خۆی ملی ڕێگەی گرتەبەر. پیاوێکی ئازا بەڵام نەزان وکەر بو. ڕۆشتە بەردەم خێوەتەکەی عومەر کوڕی سەعد و بەبەرزترین دەنگ هاواری کرد:

اوقر رکابی فضة و ذهبا — انی قتلت السید المحجبا

قتلت خیر الناس اما و ابا — وخیرهم اذ ینسبون نسبا

یانی: زێر و زیوی فراوانم پێ ببەخشە، من سەروەرێکی بەڕێزکراوم کوشت. باشترین

پیاوێك كە باشترین دایك و باوكی بو، كوشتم و باشترینی ئەوان كاتێك باسی نەژادی خۆیانیان دەكرد.

عومەر كوڕی سەعد وتی: شایەتی دەدەم كە نەزان و شێتیت. بیهێننە لای من. كاتێك هات، قامچیەكی لەسەریدا و وتی: پیاوی شێت، ئەم قسانە دەهێنیتە سەرزمان؟ سوێند بەخوا ئەگەر كوڕی زیاد ئەمەی دەبیست، سەری دەبڕیتی. عومەر كوڕی سەعد، عوقبە كوڕی سێمعان كۆیلەی رەباب كچی ئەمرۆئەلقەیسی كەلبی هاوسەری حسین كوڕی عەلی بینی. پرسی: تۆ كێیت؟ وتی: كۆیلەم لەناو سامانی كەسەكانم. عومەر ئەوی ئازاد كرد. لەهاوەڵانی حسین جگە لەو و مورەقەع كوڕی سومامە ئەسەدی كەس رزگاری نەبو. تیرەكانی ئەو كۆتایی هات وئەو بەدەستی خاڵی شەڕی دەكرد. چەند كەسێك لەخەڵكەكەی هاتن و ئەمانیان بۆ وەرگرت وئەو هاورێ لەگەڵ ئەوان لەگۆڕەپانی شەڕ رۆشتەدەر. كاتێك كوڕی زیاد ئەمەی بیست، ئەوی بۆ زارە دورخستەوە.

دواتر عومەر كوڕی سەعد لەناو هاوەڵانی خۆی هاواری كرد: چ كەسێك داواخوزای حسین دەبێت تا جەستەكەی ئەو بەسمی ئەسپەكەی خۆی پێشێل بكات؟ دە كەس بۆ ئەم كارە خۆیان ئامادە كرد كە لەناو ئەوان ئیسحاق كوڕی حیوە حەزرەمی بو، ئەو كەسەی كراسەكەی حسین كوڕی عەلی رفاند. ئەو دواتر گیرۆدەی نەخۆشی گولی بو. ئەوان هاتن و ئەسپەكەی خۆیان بەسەر سك و سینەی جەستەی حسین غار دەدا و لاشەكەیان كوتا و لەت لەتیان كرد.

ژمارەی ئەو كەسانەی لەگەڵ حسین كوژران، حەفتا و دو كەس بون.

خەڵكانی غازریە لەبەنی ئەسەد، رۆژێك دوای كوژرانی حسین و هاوەڵانی ئەوانیان بەخاك سپارد.

لەهاوەڵانی عومەر كوڕی سەعد هەشتا و چوار كەس كوژران و دەستەیەكیش بریندار بون. عومەر لەسەر ئەوان نوێژی خوێند و بەخاكی سپاردن.

## بردنی سەری کوژراوەکان بۆ لای کوڕی زیاد

کاتێك حسین کوژرا، سەری ئەو و هاورێکانیان بە خەوەلی کوڕی یەزید و حومەید کوڕی موسلیمی ئەزدی رەوانەی دەرباری کوڕی زیاد کرد. ئەوان دەرگای کۆشکیان بەداخراو بینی. خەوەلی ڕۆشتە ماڵەکەی و سەری حسینی لەژێر تەشتی جل شۆرینەکەدانا و خزیە ناو جێگاکەی و بەنەواری هاوسەری وت: سامانێکی زۆرم بۆ هێناویتەوە، سامانێکی فراوان تا کۆتایی رۆژگاران، ئەوە سەری حسینە لەگەڵ تۆدا لەم ماڵەدایە. ژن وتی: قوڕ بەسەرت! خەڵك زێر و زیو دەهێنن و تۆ سەری کوڕی پێغەمبەری خوا! سوێند بەخوا هیچ کات لەگەڵ تۆدا لەم ماڵەدا نازیم! لەجێگەکەی هاتەدەر. دەیوت: بەردەوام دەمبینی روناکیەکی سەرسوڕهێنەر وەك ستون لەئاسمانەوە تا تەشتەکە درێژ ببویەوە. باڵندە سپیەکانم دەبینی بەدەوری ئەو تەشتەدا دەسوڕانەوە. کاتێك رۆژ بویەوە، سەری حسینی برد بۆ لای کوڕی زیاد.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو، بەڵکو ئەو کەسانەی سەرە براوەکانیان برد، شیمر و قەیس کوڕی ئەشعەس و عەمرۆ کوڕی حەجاج و عوروە کوڕی قەیس بون. کوڕی زیاد دانیشت و فەرمانی بەخەڵکدا بڕۆنە لای. سەرەکانیان لای ئەو کۆکردەوە و خستیانە سەر زەوی. ئەو بەقامچیە دارینەکەی خۆی لێوەکانی حسین کوڕی عەلی هەڵدایەوە و گەمەی بەدیانەکانی دەکرد. کاتێك زەید کوڕی ئەرقەم بینی، داردەستەکەی خۆی هەڵناگرێت، وتی: ئەو داردەستە لەسەر دیانەکانی پێشەوەی هەڵبگرە چونکە سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نیە، لێوی پێغەمبەرم بینی، ماچی ئەو لێوانەی دەکرد. دواتر بەکوڵ گریا. کوڕی زیاد وتی: خوا چاوت هەمیشە گریاناوی بهێڵێتەوە، ئەگەر پیرەپیاوێکی خڵەفاو و بێ ئاوز نەدەبویت، دەمکوشتیت. زەید هاتەدەر و بەردەوام دەیوت: ئەی عەرەبەکان، ئێوە لەمەودوا کۆیلەن. کوڕی فاتیمەتان کوشت و کوڕی مەرجانەتان کردە فەرمانڕەوا. ئەو چاکەکانتان دەکوژێت و خراپەکانتان دەکاتە کۆیلە. بەمشێوەیە تەسلیمی ریسوایی بون، مەرگ و نفرین لەو کەسە بێت، بەریسوایی رازی دەبێت.

## ڕەوانە کردنی ژنان و منالآن

عومەر کوڕی سەعد، دوای کوشتنی حسین دو ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر لەگەڵ کچەکان و خوشکەکان و منالەکانی حسین ڕوی لەکوفە کرد. عەلی کوڕی حسین کە نەخۆش بو، هاوڕێیەتی ئەوانی دەکرد. ژنان و منالآنیان لای جەستەی خوێناوی حسین و هاوەڵآنیان تێپەڕاند. ژنان هاواریان دەکرد و لەروخساری خۆیان دەدا. زێنەب خوشەکەی هاواری کرد: ئای محەممەد، ئەی کۆتایی پێغەمبەران، سلآو لەتۆ و لەفریشتەکانی ئاسمان، ئێستا حسینی تۆ لەهامونی بێ کۆتایی، لەناو خاك و خوێندایە، جەستەی لەت لەت و برینەکان وەك ئەستێرە بەلاشەیەوە دیارە، کچەکانت وەك بەندەکان، جگەر گۆشەکانت بونەتە نیشانەی تۆفانەکانی بیابان، هەر دۆست و دوژمنێك لەشینی زێنەب دەستی بەگریان کرد.

کاتێك ئەوانیان بردە لای کوڕی زیاد، زێنەب کۆنترین جل و بەرگی خۆی لەبەر کرد و خۆی نەناسراو کرد و کەنیزەکان دەوریان گرت. عوبەیداللە وتی: ئەم ژنە کێیە لەناو ئەو ژنانەدا دانیشتوە؟ زێنەب هیچی نەوت. سێ جار قسەکەی دوبارە کردەوە و وەڵآمی نەبیست. یەکێك لەکەنیزەکان هەستا و وتی: زێنەب کچی فاتیمە کچی پێغەمبەرە. کوڕی زیاد وتی: سوپاس بۆ خوا کەئێوەی ڕیسوا کرد و کوشتاری کردن و درۆکەتانی ئاشکرا کرد. زێنەب وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەمحەممەد ئێمەی بەرێز کرد و پاك و خاوێنی کردین و پێگەمانی بەرز کردەوە و ئێمەی کردە ڕێبەری خەڵکان. بەو شێوە نیە کە تۆ دەڵێیت، خراپەکار ڕیسوا دەبێت و ستەمکار درۆکەی ئاشکرا دەبێت. کوڕی زیاد وتی: خوات چۆن بینی، چی لەبنەماڵەکەت کرد؟ زێنەب وتی: کوژرانی بۆ ئەوان نوسی و ئەوان بەرەو کوشتنگەی خۆیان ڕۆشتن. بەم زوانە خوا تۆ لەگەڵ ئەوان کۆدەکاتەوە و داوەری لەنێوان ئێوەدا دەکات. کوڕی زیاد وتی: خوا سینەی منی لەکینەی برا سەرکێش و بنەماڵە سەرکێشەکەت ئارام کردەوە. زێنەب بەکوڵ گریا و وتی: سوێند بەخوا حسینت کوشت و بنەماڵەکەمت کردە نیشانەی خراپەکاران و لقەکانت بڕیم و ڕەگ و ڕیشەمت دەرهێنام. ئەگەر ئەمانە دڵی تۆ ئارام دەکاتەوە، دڵێکی بەردینت هەیە. کوڕی زیاد پێی وت: ئەمە ئازایەتیە، سوێند بەگیانی خۆم باوکیشت ئازا بو. زێنەب وتی: ژن کاری بەئازایەتی چیە؟

کاتێك کوڕی زیاد سەیری عەلی کوڕی حسینی کرد، وتی: ناوت چیە؟ وتی: عەلی کوڕی حسین. کوڕی زیاد وتی: نا، خوا عەلی کوڕی حسینی کوشت؟ عەلی بێدەنگ بو. کوڕی زیاد وتی: بۆ قسە ناکەیت؟ عەلی وتی: من برایەکەم بو ئەویش ناوی عەلی بو و خەڵك کوشتیان. وتی: کەواتە خوا ئەوی کوشت. عەلی بێدەنگ بو. وتی: بۆ قسە ناکەیت؟ وتی: خوا دەست بەجێ گیانی هەموان دەگرێت (زمر/٣٩/٤٢) و هیچ کەس بەبێ فەرمانی خوا نامرێت (ال عمران/٣/ ١٤٥). کوڕی زیاد وتی: سوێند بەخوا تۆیش یەکێکیت لەوان. دواتر بەپیاوێکی وت کە لەوێ بو: هاوار لەتۆ، بزانە کێ هاتوە؟ من گومانم وایە ئەو پیاوێکە. عەلی کوڕی حسین لەم کاتەدا بیست و یەك ساڵی بو. موڕی کوڕی موعازی ئەحمەری داوێنی کراسەکەی ئەوی بەرز کردەوە و وتی: بەڵێ، ئەو پێگەیشتوە. وتی: بیکوژە. عەلی وتی: کێ دەکەیتە سەرپەرەستی ئەم ژنانە؟ زێنەب لەئامێزی گرت و وتی: کوڕی زیاد، ئەوەندەی کە لێت کوشتوین بەسە، لەخوێنی ئێمە تێر نەبویت، کەست لەئێمە هێشتەوە؟ دواتر کوڕەکەی لەئامێز گرت و وتی: سوێندت دەدەم بەخوا، ئەگەر دەتەوێت ئەو بکوژیت، منیش لەگەڵ ئەو سەر ببڕە. عەلی پێی وت: ئەی کوڕی زیاد، ئەگەر لەنێوان تۆ و ئەوان پەیوەندی خزمایەتی هەیە، پیاوێك بکەرە سەرەپەرەستی ئەوان کە لەسەر ئایینی ئیسلام هاورێیەتی ئەوان بکات. کوڕی زیاد چەند ساتێك سەیری زێنەبی کرد و دواتر وتی: هاوار لەخزمایەتی! سوێند بەخوا دەبینم ئامادەیە ئەو لەگەڵ عەلیدا بکوژم، با ئەم کوڕە لەگەڵ ئەم ژنانە بێت.

دواتر هاواری کرد: نوێژی گشتیە. خەڵك لەمزگەوت کۆبونەوە. ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و دەستی بەوتار خوێندن کرد و وتی: سوپاس بۆ خوا کەراستی و دروستی ئاشکرا کرد و لایەنگرانی بەهێز و هاوکاری سەروەری باوەڕداران یەزید کوڕی معاویەی کرد و درۆزنی درۆزن زادەی لەناو برد.

عەبدالله کوڕی عەفیفی ئەزدی والبی کە پیرەپیاوێکی کوێر بو، هەستا. یەکێك لەچاوەکانی لەشەڕی وشتر لەناو سوپاکەی عەلیدا و چاوەکەیتری لەشەڕی سەفین لەدەستدابو. ئەو بەهیچ شێوەیەك لەمزگەوت نەدەڕۆشتەدەر. لە بەیانیەوە تا ئێواری نوێژی دەخوێند و دواتر دەگەڕایەوە بۆماڵەکەی خۆی. کاتێك وتارەکەی کوڕی زیادی بیست، وتی: کوڕی مەرجانەی خراپەکار، دۆزنی درۆزن زادە تۆیت و باوکت و ئەو

کەسەی تۆی کردە فەرمانڕەوای خەڵك. کوڕی مەرجانە، منالی پێغەمبەر دەکوژن و وتاری خۆپاریزان و خواپەرستەکان دەهێنیتە سەرزمان. کوڕی زیاد وتی: بیهێنن بۆ ەی من. گرتیان. بانگی ئەزدیەکانی کرد: ئای چاکەکاران، چەندین گەنج لەئەزد هەستان و رزگاریان کرد. کوڕی زیاد چەند کەسێکی رەوانە کرد و کوشتیان و دواتر لەبەردەرگای مزگەوت هەڵیانواسی. خوا لێی خۆشبێت.

کوڕی زیاد فەرمانیدا سەری حسینیان لەسەراسەری کوفەدا سوڕاند. بەوتەی هەندێ کەس، سەری حسین یەکەم سەر بو لەئیسلامدا بەدارەوە کرا. راستیەکەی ئەوەیە یەکەم سەر، سەری عەمرۆ کوڕی حەمیق بو (لەشوێنکەوتەکانی عەلی کە معاویە سەری کرد بەدارەوە).

کوڕی زیاد سەری حسین و هاوەڵانی لەگەڵ دەستەیەك بەسەرکردایەتی زەخر کوڕی قەیس بۆ لای یەزید لەشام رەوانە کرد.- دەستەیەك دەڵێن: لەگەڵ دەستەیەك بەسەرکردایەتی شیمر. ژنان و منالەکانیشیان لەگەڵ ئەواندا رەوانە کرد. کوڕی زیاد زنجیری کردە ملی عەلی و ژنان و منالانی سوار وشترەکان کرد. عەلی کوڕی حسین لەرێگادا قسەی نەکرد تا گەیشتنە شام. کاتێك زەخر کوڕی قەیس ڕۆشتە لای یەزید، وتی: چیت پێیە؟ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مژدەی سەرکەوتن و هاوکاری خوات لێ بێت. حسین کوڕی عەلی هاوڕێ لەگەڵ هەژدە کەس لەکەسانی بنەماڵەکەی و شەست کەس لەشوێنکەوتەکانی لای ئێمە دابەزی. ئێمە روبەرویان بوینەوە و داوامان لێکردن ملکەچی فەرمانی فەرماندەکەمان عوبەیدالله کوڕی زیاد ببن یا شەڕ دەست پێبکەن. ئەوان شەڕیان هەڵبژارد. ئێمە لەگەڵ هەلاتنی خۆر هێرشمان کردە سەریان و لەهەر چوار لاوە گەمارۆماندان. کاتێك شمشێرەکان بەسەریاندا داباری‌ن، بۆ هەر سوچ و قوژبنێك رایان کرد و رێگەی تەپۆلکە و چاڵەکانیان گرتەبەر. سوێند بەخوا زەمانێکی زیاتر لەسەر بڕینی قوربانیەك یاخەوتنی بەناگایەك تێنەپەڕی کە هەمویانمان کوشت. ئێستا جەستەکانیان رووتە و جلەکانیان خوێناویە و پۆزەیان لەخاك دراوە. خۆر دەیانسوتێنێت و با بەسەریاندا هەڵدەکات، لاشخۆر و کەمتیارەکان سەردانیان دەکەن و گۆڕەکانیان دەشتێکی وشك و بێ کۆتاییە.

دەڵێت: چاوەکانی یەزید پڕبو لەفرمێسك. وتی: من لەم کەردن درێژییەی ئێوە بەشتێك

کەمتر لەکوشتنی حسین رازی دەبوم. خوا کوڕی سومەییە نفرین بکات. سوێند بەخوا ئەگەر خۆم روبەروی دەبومەوە، لێی خۆش دەبوم. خوا لەحسین خۆش بێت.

یەزید هیچ بەخششێکی بەو پیاوە نەدا.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك کەسانی بنەماڵەی حسین گەیشتنە کوفە، کوڕی زیاد ئەوانی خستە زیندان و هەواڵەکەی بۆ یەزید رەوانە کرد. ئەو کاتەی لەزیندان بون، بەردێکیان بۆ هاویشتن کەنوسراوێکی پێوە بو. نوسراوەکە دەیوت: نێردراو بەهەواڵی ئێوە ڕۆیشتە لای یەزید، لەفلاّن رۆژ دەگات و لەفلاّن رۆژ دەگەڕێتەوە. ئەگەر بانگی تەکبیرتان بیست، دڵنیابن لەمەرگی خۆتان، ئەگەر بانگی تەکبیرتان نەبیست، بزانن کەئەمان بەخشراون. کاتێك دو یا سێ رۆژ بۆ گەڕانەوەی نێردراو مابو، بەردێکی دیکەیان بۆ هاویشتن کە دەیوت، دوایین پێشنیارەکانی خۆتان بکەن و ماڵئاوایی لەیەك بکەن چونکە گەڕانەوەی نێردراوەکە نزیك بۆتەوە. دواتر نێردراو گەڕایەوە و فەرمانی یەزیدی بۆ رەوانە کردنی ئەوان هێنا. کوڕی زیاد، شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن و موحەففەر کوڕی سەعلەبەی بانگ کرد و سەری حسین و بار و بنەی ئەسیرەکانی لەگەڵ ئەواندا رەوانە کرد. کاتێك گەیشتنە دیمەشق، موحەففەر کوڕی سەعلەبە لەکۆشکی یەزید هاواری کرد: سەری نەزانترین و ریسواترینی خەڵکانمان هێناوە. یەزید وتی: ئەوەی مامە خراپەکارەکەی تۆ هێنایە دونیا، نەزانترین و ریسواترینی خەڵکان بو. حسین پچڕێنەی پەیوەندی خزمایەتی و هۆکارەکانی ستەمکاری بو..

دواتر ڕۆشتنە لای یەزید و سەری حسینیان لەبەردەمیدا دانا و قسەیان لەگەڵ کرد. هند کچی عەبدالله کوڕی عامر کوڕی کورەیز کە هاوسەری یەزید بو، قسەکەی بیست و جل و بەرگی لەبەر کرد و هاتەدەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا سەری حسین کوڕی فاتیمە کچی پێغەمبەری خوایان هێناوە؟ وتی: بەڵێ، بۆ ئەو بگری وبۆ کچی پێغەمبەری خوا پرسە بگێرە و هۆنراوە خەمگینەکان بخوێنە. کوڕی زیاد پەلەی کرد و ئەوی کوشت، خوا بیکوژێت. دواتر فەرمانی بەخەڵکدا ، کۆبونەوە و سەرەکە لەبەردەمی ئەودا بو و ئەو بەداردەست گەمەی بەدیانەکەی حسین دەکرد. دواتر وتی: خواوەند ئەو کارەی لەگەڵ کردین کە حوصەین کوڕی حومام دەڵێت:

ابی قومنا ان ینصفونا فانصفت      قواضب فی ایماننا تقطر الدما

یفلقن هاما من رجال اعزة　　　　علینا و کانوا هم اعق و اظلما

یانی: خەڵکانی ئێمە نەیانویست مافی ئێمە بدەن و ئەم کارەیان بەو شمشێرە تیژە سپارد کە لەدەستی ئێمەدا بون و خوێنیان دەڕژاند. سەری پیاوانێکی بەڕێزیان خستە بەردەم ئێمە کە خاوەنەکانیان تیژتر و ستەمکارتر بون.

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی پێی وت: ئایا بەداردەستەکەت گەمە بەددانەکانی حسین دەکەیت؟ زۆرجار بینیم پێغەمبەری خوا لەم ددانانە ماچی دەکرد. ئەی یەزید، ڕۆژی هەستانەوە تۆ دێیت کە کوڕی مەرجانە پاڕانەوەت بۆ بکات و ئەمە دێت کەمحەممەد بۆی دەپاڕێتەوە. ئەمەی وت و هەستا و ڕۆشتەدەر.

یەزید وتی: ئەی حسین، سوێند بەخوا ئەگەر من ڕوبەڕوی تۆ دەبومەوە، نەمدەکوشتی. دواتر وتی: ئایا دەزانن ئەم گەورە پیاوە لەکوێوە زیانی بەرکەوت؟ دەیوت: باوکم باشتر لەباوکی یەزیدە، دایکم بەرێزتر لەدایکی ئەو، باوەگەورەم بەرێزتر لەباوەگەورەی ئەو و خۆم باشتر و شیاوترم لەو. بەڵام ئەوەی کەدەڵێت، باوکم باشترە لەباوکی یەزید، باوکم باوکی ئەوی بۆ سپاردنی داوەری بەخوا سپارد و خەڵکان دەزانن لەبەرژەوەندی کێ کۆتایی هات، ئەوەی کەدەڵێت، دایکم باشترە لەدایکی ئەو، سوێند بەخوا ڕاست دەکات و دایکی باشترە لەدایکی من. بەڵام ئەوەی کەدەڵێت باوەگەورەم باشترە لەباوەگەورەی ئەو، سوێند بەخوا لەناو ئێمەدا کەسێك نیە باوەڕی بەخوا وڕۆژی هەستانەوە هەبێت و گومانی ئەوە بکات کەپێغەمبەر لەنێوان ئێمەدا هاوتایی هەبێت. ئەو لەڕێگەی زانستی دینی خۆیەوە زیانی پێگەیشت و ئەگەری هەیە بیری نەبێت کەخوا دەفەرمێت: ئەی خوایە، بەخشندەی پادشایی تۆیت، بەهەر کەسێك بخوازیت، دەیبەخشیت و لەهەر کەسێك بتەوێت، وەریدەگریتەوە (ال عمران/ ٢٦/٣).

دواتر ژنەکانی حسینیان بردە لای ئەو و سەری حسین بەهەمان شێوە لەبەردەمیدا بو. فاتیمە و سەکینە دو کچەکەی حسین بەردەوام هەوڵیان دەدا سەرەکە ببینن و یەزید هەوڵی دەدا نەهێڵێت. کاتێك سەرەکەیان بینی، شین و گریانیان دەست پێکرد. ژنەکانی یەزید قیژاندیان و کچەکانی معاویە دەستیان بەگریان کرد. فاتیمە کچی حسین کە ساڵێك لەسەکینە گەورەتر بو، وتی: ئەی یەزید، ئایا کچەکانی پێغەمبەری خوا هاوشێوەی بەندەکان بن؟ یەزید وتی: کچی براکەم، من زیاتر ڕقم لەم کارە بو. کچ وتی:

سوێند بەخوا هیچ دەستبەند و گەردنبەند و شتێکمان پێوە نەماوەتەوە. یەزید وتی: ئەوەی بەئێوەی دەدەن زیاتر لەوە دەبێت کە لێیان سەندون. پیاوێك لەخەڵکانی شام هەستا و وتی: ئەم کچە بەمن ببەخشە(داوای فاتیمەی دەکرد). ئەو داوێنی زێنەبی گرت کە لەو گەورەتر بو. زێنەب وتی: درۆت کرد و پەستی، نە شیاوە بۆ تۆ ئەو کارە بکەیت نە یەزید. یەزید تورە بو و وتی: درۆت کرد، سوێند بەخوا ئەم کارە شیاوە بۆ من و ئەگەر بمەوێت، دەیکەم. کچ وتی: سوێند بەخوا هەرگیز، خوا توانایی ئەو کارەی پێ نەداویت. ناتوانی ئەو کارە بکەیت مەگەر ئەوەی پشت بکەیتە ئەم ئایینە و دینێکی تازە بۆ خۆت هەڵبژێریت. یەزید تورە بو و ئاوز لەسەریدا نەما. وتی: بەم شێوەیە لەگەڵ من قسە دەکەیت. باوك و براکەی تۆ بون لەدین هەڵگەڕانەوە. زێنەب وتی: سوێند بەخوا هاتیتە سەر ئایینی باوك و برا و باوەگەورێی من و لەگومڕایی هاتیتەدەر. یەزید وتی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا. زێنەب وتی: تۆ فەرمانڕەوایت، بەستەم بەردەوام جوێن دەدەیت و بەزۆر سەرکوت دەکەیت؟ یەزید شەرم دایگرت و بێدەنگی هەڵبژارد. ئەوانیان بردە ناو ماڵەکانی یەزید. هیچ ژنێك لەبنەماڵەی یەزید نەمایەوە مەگەر ئەوەی هاتە لایان و لەپرسەکەی ئەوان بەشداری کرد. هەمویان پرسەیان گێڕا. لەوانیان پرسی چیان لەدەست داوە و لەبری ئەوە چەندین بەرابەریان دانەوە. سەکینە دەیوت: لەیەزید کوڕی معاویە زیاتر کەسم نەبینیوە بەخوا ناباوەڕتر بێت.

دواتر فەرمانیدا و عەلی کوڕی حسینیان زنجیر لەمل هێنایە ژوور. عەلی وتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ئێمە لەزنجیردا دەبینی، ئازادی دەکردین. یەزید وتی: ڕاست دەکەیت. فەرمانیدا و زنجیرەکەیان کردەوە. عەلی وتی: ئەگەر پێغەمبەر ئێمەی بەنائاشنا دەبینی، لەخۆی نزیکی دەکردینەوە. فەرمانیدا و ئەویان لەنزیك یەزیدەوە دانیشاند. یەزید پێی وت: ئەی کوڕی حسین، باوکی تۆ پەیوەندی خزمایەتی منی پچڕاند و مافەکانی منی بەڕەوا نەزانی و لەسەر پاشایەتیەکەم شەڕی لەگەڵ کردم و لەبەر ئەمە خوا ئەو کارەی لەگەڵدا کرد کە بەچاوی خۆت بینیت. عەلی وتی: ئەوەی پێشهاتێکی مەترسیدار و پرسەئافرێن بۆ ئێوە ڕوبدات، لەزەوی یا لەناخی خۆتانا بێت، پێش ئەوەی دەرکەوێت، بەنوسراوێك پشت ڕاست دەکرێتەوە، ئەم کارە بۆ خوا ئاسانە. ئەمە لەبەر ئەوەیە بۆ ئەو شتەی لەدەستی دەدەن، داخ نەخۆن و بۆ ئەوەی بەدەستی دێنن، شادمان نەبن.

خواوەند هیچ مەلێکی مل درێژی خۆش ناوێت (حدید/٥٧/٢٢-٢٣) یەزید وتی: ئەوەی پێشهاتی پرسەئافرێن بۆ ئێوە روبدات، دواهاتی کردارەکانی خۆتانە(شورا/٤٢/٣٠). دواتر بێدەنگ بو و فەرمانیدا ئەو و ژنەکانی هاورێی ئەویان لەماڵێکی جیاوازدا جێگە کردەوە. یەزید نانی نیمەرۆ و ئێوارێی نەدەخوارد مەگەر ئەوەی عەلی بانگ دەکرد. رۆژێك ئەوی بانگ کرد و عەمرۆ کوڕی حەسەن لەگەڵ ئەودا بو. یەزید بەعەمرۆی وت: لەگەڵ کوڕەکەم خالید کوڕی یەزید شەڕ دەکەیت؟ عەمرۆ وتی: کێردێك بدە بەو و کێردێك بدە بەمن، تا شەڕ بکەین. یەزید ئەوی لەئامێز گرت و وتی: ئەمە عادەتێکە تەنیا لەئەخرەمدا دەمبینێ. ئایا مار جگە لەمار دەزێت؟

دەڵێن: کاتێك سەری حسین گەیشتە لای یەزید، رۆژگاری کوڕی زیاد لای ئەو بەرزتر بویەوە، دارایی پێبەخشی و خواستەکانی بەدیهێنا و تا ئەو جێگەی توانی شادمانی کرد. زۆری نەخایاند بێزاری گشتی خەڵك بەگوێی گەیشت و بیستی کەخەڵك بەئاشکرا جوێنی پێدەدەن و نفرینی دەکەن. لە کوژرانی حسین پەشیمان بویەوە و داخی خوارد. دەیوت: چی دەبو ئەگەر ئازارەکانم بۆ خۆم هەڵدەگرت و حسینم لەماڵەکەمدا جێگە دەکردەوە و لەوەی دەیویست دەمکردە داوەر و ئەگەرچی دەبوە هۆکاری لاوازی پاشایەتی من، دەبوا ئەم کارەم لەبەر رێز گرتنی بنەماڵەی پێغەمبەر دەکرد. خوا کوڕی مەرجانە نفرین بکات کەحسینی ناچار کرد. ئەو داوای کرد بێت و دەست بخاتە ناو دەستی من یا بڕواتە یەکێك لەشارەکان تا ئەو کاتەی بۆ دیداری خوا دەڕوات. بەڵام رازی نەبو و حسینی کوشت و بەکوشتنی ئەو منی کردە دوژمنی موسوڵمانان و ئەوانی لەمن بێزار کرد و تۆوی کینەی لەدڵی ئەواندا چاند بەشێوەیەك چاکەکار و خراپەکار من بەدوژمنی خۆیان دەزانن چونکە کوژرانی حسینیان لەسەر دەستی من بەکارێکی گەورە و گران دەزانن. من کارم بە کاری کوڕی مەرجانە چیە؟ خوا نفرینی بکات.

کاتێك ویستی ئەوان بۆ مەدینە رەوانە بکات، فەرمانی بەنەعمان کوڕی بەشیردا، کە هەرچیان دەوێت و پێویستیان بەهەر شتێکە، بۆیان ئامادە بکات و ئەوان لەگەڵ پیاوێك لەشامەوە رەوانە بکات و چەندین سواریان بکاتە هاورێ تا دەیانگەیێنە مەدینە. عەلی بانگ کرد تا ماڵئاوایی لێ بکات. پێی وت: خوا کوڕی مەرجانە نفرین بکات. سوێند بەخوا ئەگەر من روبەروی دەبومەوە، هیچ پێشنیارێکی نەدەکرد مەگەر ئەوەی رازی

دەبوم و مەرگم بەهەمو هێزی خۆم، ئەگەر بەبەهای مەرگی یەکێك لەمناڵەکانیشم بوایە، لەو دور دەکردەوە. بەلاّم خوا ئەو کارەی ویست، کەبینیت. کوڕی خۆم، هەر نیازێکت هەبو، منی لێ ئاگادار بکەرەوە. نێردراوەکەی راسپارد، هیچ چاکەیەکیان لێ دریّغ نەکات. ئەوانی بردە دەر و شەوانە رێگەیان دەبڕی بەشێوەیەك لەبەرچاویدابن و لێی دورنەکەونەوە. کاتێك دەوەستان، لەوان دور دەکەوتەوە بەلاّم وەك پاسەوان بەدەوریاندا دەسوڕا. لەنیازەکانی ئەوانی دەپرسی و بەمیهرەبانیەوە هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکردن تا گەیشتنە مەدینە. فاتیمە خوشکی عەلی بەزێنەبی خوشکی وت: ئەم پیاوە (نێردراوەکەی یەزید) چاکەی لەگەڵ کردین، شیاوە پاداشتی بدەینەوە؟ وتی: سوێند بەخوا جگە لەخشڵەکانی خۆمان هیچمان نیە پێی بدەین. ئەم دو خاتونە دەسبەندەکانی خۆیان دەرهێنا و بۆ پیاوەکەیان نارد و داوای لێبوردنیان کرد. ئەو وەرینەگرت و وتی: ئەگەر ئەو کارەی کردم، لەبەر ئەم جیهانەم دەبو، دیاریەکانی ئێوە رازی و شادمانی دەکردم، بەلاّم سوێند بەخوا ئەم کارەم تەنیا لەبەر خوا و لەبەر نزیکی ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر کرد.

رەباب کچی ئەمرۆئەلقەیس هاوسەری حسین، دایکی سەکینە هاورێیەتی حسینی دەکرد کە بۆ شام برا و دواتر گەرێنرایەوە بۆ مەدینە. گەورەکانی قورەیش خوازبێنیان لێکرد بەلاّم وتی: کەسێك نیم دوای پێغەمبەری خوا کەس بکەمە خەزوری خۆم. دوای کوژرانی حسین ساڵێك ژیا و نەڕۆشتە ژێر هیچ سەقفێك تا لاواز و ناتەوان بو و بەخەمەوە سەری نایەوە. دەستەیەك دەڵێن: یەك ساڵ لای گۆڕەکەی ئەو مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە و لەوێ مرد.

عوبەیداللە کوڕی زیاد، مژدە دەرێکی بۆ لای عەمرۆ کوڕی سەعید لەمەدینە رەوانە کرد تا هەواڵی کوژرانی حسین بەو شارە رابگەیەنێت. پیاوێك لەقورەیش چاوی پێیکەوت و پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟. وتی: هەواڵەکەت لای فەرماندار دەست دەکەوێت. قورەیشی وتی: هەمومان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەرێینەوە (بقرە ١٥٦/٢). حسین کوژرا.

مژدەدەر گەیشتە لای عەمرۆ کوڕی سەعید. عەمرۆ پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟ وتی: ئەوەی دەبێتە هۆی شادمانی فەرماندار، حسین کوڕی عەلی کوژرا. کوژرانی ئەو بەدەنگی

بەرز ڕاگەیێنە. ئەو جارێدا. ژنانی بەنی هاشم هاواریان کرد و کچی عەقیل کوڕی ئەبی تالب هاورێ لەگەڵ ژنانیتر لەبنەماڵەکەی بەسەری ڕووت هاتەدەر جلەکانی لەدەوری خۆی دەئالآند و دەیوت:

ماذا تقولون ان قال النبی لكم ماذا فعلتم و انتم اخر الامم

بعترتی و باهلی بعد مفتقدی منهم اساری و منهم ضرجوا بدم

ما كان هذا جزائی اذ نصحت لكم ان تخلفونی بسو ء فی ذوی رحمی

یانی: چ دەڵێن ئەگەر پێغەمبەر بەئێوە بڵێت، ئێوە کە دوایین ئۆمەتن، دوای مردنی من، چیتان لەگەڵ بنەماڵەکەی من کرد؟ دەستەیەکیان لەخاك و خوێندا گەوزان و دەستەیەکیان گرفتار بون و ئەسیر کران. ئەمە پاداشتی پێغەمبەرێکی وەك من ئەبو چونکە چاکەخوازی ئێوە بوم، ئەدەبوا جێگرانێکی بێ شەرم و بوێر بۆ سەر بنەماڵەکەی من دەبون.

کاتێك عەمرۆ کوڕی سەعید قاوەقیژی ژنانی بیست، پێکەنی و وتی:

عجت نساء بنی زیاد عجة كعجیج نسوتنا غداة الارنب

یانی: ژنانی بەنی زیاد بەشێوەیەك گریان کە ژنانی ئێمە لەشەڕی (ئەرنەب) ئەو کارەیان کرد.

ئەرنەب شەرێك لەنێوان بەنی زوبەید لەزیانی بەنی زیاد لەبەنی حارس کوڕی کەعب بو وئەمە هۆنراوەی عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب بو.

عەمرۆ وتی: پرسەیەك هاوشێوەی پرسەی عوسمانە. ئەو ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و خەڵکی لەکوژرانی حسین ئاگادار کردەوە.

کاتێك هەواڵیان بە عەبدالله کوڕی جەعفەردا کە دو کوڕەکەی لەگەڵ حسین کوژراون، چەند کەسێك لەخزمان و کۆیلەکانی ڕۆشتنە لای و دڵیان دایەوە و خەڵکیش لەهەمان کات سەرەخۆشیان لێدەکرد. یەکێك لەکۆیلەکانی وتی: ئەم زیانەمان لەحسینەوە پێبڕا. عەبدالله پێلاوی کێشا بەسەریدا و وتی: ئەی زادەی ژنی بۆگەن، قسە بەحسین دەڵێیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر دەمدۆزیەوە، حەزم دەکرد لێی جیا نەبمەوە تا شان بەشانی ئەو بکوژرێم. سوێند بەخوا ئەمە شتێکە گیانم بەئاسانی دەیبەخشێت و پرسەی من لەخەمی ئەوان سوك دەکات. ئەم دوانە هاورێ لەگەڵ برا و کوڕە مامەکەم کوژران و

خۆراگریان کرد و گیانیان کردە قوربانی ئەو. دواتر وتی: ئەگەر خۆم نەبوم، خۆزگەم بەکوڕەکانم کە لەپێناو حسیندا کوژران.

کاتێك خەڵکانی کوفە سەری حسینیان برد بۆ شام و بردیانە ناو مزگەوتی دیمەشق، مەروان کوڕی حەکەم ڕۆشتە لای ئەوان و پرسی: چیتان کرد؟ ئاگاداریان کردەوە. ئەو لای ئەوان هەستا. دواتر براکەی یەحیا کوڕی حەکەم هەستا و هەمان پرسیاری لێکردن و هەمان وەڵامی دەست کەوت. وتی: لەرۆژی هەستانەوە لەمحەممەد و خۆشەویستی ئەو دور دەبن. ئیتر لەهیچ کارێکدا هاورێیەتی ئێوە ناکەم. کاتێك ڕۆشتنە لای یەزید، یەحیا کوڕی ئەکسەم وتی:

| | |
|---|---|
| لهام بجنب الطف ادنی قرابة | من ابن زياد العبد ذی الحسب الوغل |
| سمية امسی نسلها عدد الحصی | و ليس لال المصطفی اليوم من نسل |

یانی: ئەو سوپایەی لەبەرزاییەکانی زەوی شەڕی کرد، خزمایەتی زیاتری لەگەڵ پێغەمبەری خوا هەبو تا زیادی کۆیلەی کۆیلە زادە کە نەژادی خۆی نەخوازراو بۆ ئەبوسوفیان دەگەڕێنێتەوە. سومەییە بەئەندازەی وردە بەردەکان منالی هەیە و بنەماڵەی مستەفا ئەمرۆ منالەکانی لەناو ئێمەدا نین.

یەزید مشتی لەسینەیدا و وتی: بێدەنگ بە. دەڵێن: کاتێك حسین کوژرا، یەکێك لەخەڵکانی مەدینە لەکەسێکی بیست کە دەیوت:

| | |
|---|---|
| ايها القاتلون جهلا حسينا | الشروا بالعذاب و التنكيل |
| كل اهل السماء يدعو عليكم | من نبی و ملاك و قبيل |
| قد لعنتم علی لسان ابن داو | د و موسی و صاحب الانجيل |

یانی: ئەی ئەو کەسانەی بەنەزانی حسینتان کوشت، مزدەتان لێ بێت بەریسوایی و ئەشکەنجەی خوایی، هەمو دانیشتوانی ئاسمان، لەپێغەمبەران و فریشتەکان و کەسانیتر، نفرینی ئێوە دەکەن. ئێوە لەسەر زمانی داوود و موسا کوڕی عیمران و خاوەندی ئینجیل نفرین کراون.

خەڵك دوسێ مانگ چاوەڕێیان کرد و بەردەوام دەیانبینی لەکاتی هەڵاتنی خۆر، تا بەرزبونەوەی هەتاو، دیوارەکانی بەخوێن ڕەنگ کراون. سەرکردەی مەسیحیەکانی ئەو ڕۆژگارە دەیوت: هیچ جارێك ڕوینەدا لەکەربەلا تێپەڕم مەگەر ئەوەی ئەسپەکەی خۆم

غاردەدا تا بەخێرایی لەو شوێنە دورکەومەوە چونکە نێمە لەناو خۆماندا دەمانزانی زادەی پێغەمبەر لەوێ دەکوژرێت. من بەردەوام دەترسام، کاتێك حسین کوژرا، نارامیم پێبڕا و لەمەودا بەسواری لەوێ تێپەرِم دەکرد بەلاّم نەسپەکەم غار نەدەدا.

دەڵێن: کاتێك حسین کوژرا، پەنجاو پێنج ساڵ تەمەنی بو. دەستەیەك دەڵێن: شەست و یەك ساڵ کە نەمە راست نیە. پەنجا ساڵی بو وئەمە راستترە.

کوژرانی نەو لەرۆژی عاشورا (دەیەم رۆژی مانگی موحەرەم) ساڵی شەست و یەك / ١٠ نۆکتۆبەری ٦٨٠ زایینی رویدا.

تیمی تیم کە لەهەموان دابڕابو وبەردەوام لەگەڵ هاشمیەکان ژیانی بەسەر دەبرد، لەپرسەی حسیندا وتی:

| | |
|---|---|
| مررت على ابيات ال محمد | فلم ارها امثالها يوم حلت |
| فلا يبعد الله الديار و اهلها | و ان اصبحت من اهلها قد تخلت |
| و ان قتيل الطف من ال هاشم | اذل رقاب المسلمين فذلت |
| و كانوا رجاء ثم اضحوا رزية . | لقد عظمت تلك الرزايا و جلت |
| و عند غنى قطرة من دمائنا | سنجزيهم يوما بها حيث حلت |
| اذا افتقرت قيس جبرنا فقيرها | تقتلنا قيس اذا النعل زلت |

یانی: لای ماڵی بنەماڵەی محەممەد تێپەرِم کرد بەلاّم نەوانم بەشێوەیەك نەبینی کاتێك پیاوەکانیان لەناویاندا بون. خوا نەوان یا کەسەکانیان دور نەخاتەوە هەرچەندە نەمرِۆ کەسیان لێ نەماوەتەوە. کوژراوی نەو دەشتە بەرزە (یا کۆتایی روبار) لەبنەماڵەی هاشم، بەمێهرەبانی و پیرۆزی خۆی گەردنی موسڵمانانی رام و دەستەمۆی خۆی کرد و هەموان بونە فەرمانبەری نەو. نەوان هیواکان بون کە نێستا بونەتە داخەکان. نەم پرسانە گەورە بون و گران. لەبنەماڵەی (غەنی) دڵۆپێك لە خوێنی نێمەیە. نەوان بۆ هەر شوێنێك کۆچ بکەن و لەهەر شوێنێك دابەزن، رۆژێك لەرۆژان سزایان دەدەین. کاتێك قەیس هەژار ببێت، هەژارەکانیان دەلاوێنینەوە بەلاّم کاتێك پێلاو خوار ببێت، قەیس کوشتارمان دەکات.

## ناوی ئەو کەسانەی لەگەڵ حسین کوڕی عەلیدا کوژران

سلێمان دەڵێت: کاتێك حسین و هاورێکانی کوژران، سەری ئەوان رەوانەی لای کوڕی زیاد کرا. خەڵکی کێندە سیانزە سەریان برد بەسەرکردایەتی قەیس کوڕی ئەشعەس، خەڵکی هوزین بەسەرکردایەتی شیمر کوڕی زی ئەلجەوشنی زەبابی بیست سەر، بەنی تەمیم حەفدە سەر، بەنی ئەسەد شەش سەر، مێزحەج حەوت سەر، شەرکەرانیتر حەوت سەر و هەموویان پێکەوە حەفتا سەر.

کوژراوانی رۆژی عاشورا ئەم کەسانە بون:

١- حسین کوڕی عەلی کە بەدەستی سینان کوڕی ئەنسی ئەخەعی کوژرا.

٢- عەباس کوڕی عەلی، دایکی ام البنین کچی حیزام کە بەدەستی زەید کوڕی روقادی جونوبی و حەکیم توفەیلی سەنبیسی کوژرا.

٣- جەعفەر کوڕی عەلی، دایکی ام البنین

٤- عەبداللە کوڕی عەلی، هەروەها دایکی ام البنین

٥- عوسمان کوڕی عەلی، دایکی ام البنین. خەوەلی کوڕی یەزید تیرێکی بۆ هاویشت و کوشتی.

٦- محەممەد کوڕی عەلی کە دایکی (دایکی مناڵ) بو وپیاوێك لەبەنی دارم کوشتی.

٧- ئەبوبەکر کوڕی عەلی، دایکی دایکی لەیلای دارمی کچی مەسعود کە لەکوژرانی ئەودا گومان هەیە.

٨- عەلی کوڕی حسین کوڕی عەلی (عەلی گەورە) دایکی لەیلا کچی مورە کوڕی عوروەی سەقەفی دایکی ئەمەیان مەیمونە کچی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب کە مونقیز کوڕی نەعمانی عەبدی کوشتی.

٩- عەبداللە کوڕی حسین کوڕی عەلی، دایکی رەباب کچی ئەمرۆ ئەلقەیسی کەلبی کە هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمی کوشتی.

١٠- ئەبوبەکر کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کە دایکی دایکی مناڵ بو و حەرملە کوڕی کاهن ئەوی بەتیر کوشت.

١١- قاسم کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کە سەعد کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیلی ئەزدی ئەوی کوشت.

١٢- عون کوڕی ئەبی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب. دایکی جەمانە کچی موسەییب کوڕی نەجەبە فەرازی کوڕی عەبداللە کوڕی قوتەبەی تایی ئەوی کوشت.

١٣- محەممەد کوڕی عەبداللە کوڕی جەعفەر. دایکی خەوصا کچی خەصەفە کوڕی تیم الله سەعلەبە کە عامر کوڕی نەهشەل تیمی ئەوی کوشت.

١٤- جەعفەر کوڕی عەقیل کوڕی ئەبی تالب، دایکی ام البنین کچی شەقر کوڕی هەزاب کە بیشر کوڕی خەوتی هەمەدانی ئەوی کوشت.

١٥- عەبدولرەحمان کوڕی عەقیل، دایکی (دایکی منالّ) کە عوسمان کوڕی خالیدی جوهەنی ئەوی کوشت.

١٦- عەبداللە کوڕی عەقیل کە لەسەر دەستی عەمرۆ کوڕی صوبەیحی صەیداوی کوژرا.

١٧- موسلیم کوڕی عەقیل، کە لە کوفەدا کوژرا.

١٨- عەبداللە کوڕی موسلیم کوڕی عەقیل، دایکی روقیە کچی عەلی کوڕی ئەبی تالب کە عەمرۆ کوڕی صوبەیحی صەیداوی یا مالك کوڕی نوسیدی حەزرەمی ئەوی کوشت.

١٩- محەممەد کوڕی ئەبی سەعید کوڕی عەقیل، دایکی دایکی منالّ کە لەقیت کوڕی یاسر ئەوی کوشت.

دو کەس بەبچوك زانران: حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی دایکی خەوڵە کچی مەنزور کوڕی زەبانی فەرازی و عەمرۆ کوڕی حسین، دایکی (دایکی منالّ). ئەم دوانەیان نەکوشت.

٢٠- سلێمان، کۆیلەی حسین کەسلێمان کوڕی عەوفی حەزرەمی ئەوی کوشت.

٢١- مونجیح کۆیلەی حسین کوڕی عەلی

٢٢- عەبداللە کوڕی بوقتور، هاوشیری حسین کوڕی عەلی.

عەبداللە کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو شەوەی حسین کوڕی عەلی لەرۆژەکەیدا کوژرا، پێغەمبەرم لەخەودا بینی کەمەسینەیەکی لەخوێن پڕ دەکرد. پرسیم: ئەی پێغەمبەری خوا، لەم مەسینەدا چیە؟ فەرموی: خوێنی حسین و هاورێکانیەتی. ئەوان کۆدەکەمەوە و بۆ لای خوای دەبەم. کاتێك بەیانی بویەوە، کوڕی عەباس خەڵکی لەکوژرانی حسین

ئاگادار کردەوە و خەوەکەی خۆی گێڕایەوە. زانرا کە حسین لەهەمان رۆژدا کوژرا.

هەروەها دەگێڕنەوە کەپێغەمبەری خوا خۆڵی لەگڵی حسین بەدایکی سەلەدا کە جبرائیل بۆی هێنابو. پێغەمبەر بەدایکی سەلەی وت: کاتێك ئەم خاکە دەبێتە خوێن، حسین کوژراوە. دایکی سەلە خاکەکەی لەناو مەسینەیەك هەلگرت. کاتێك حسین کوژرا، خاکەکە بو بەخوێن. ئەویش هەمان رۆژ خەلکی لەکوژرانی حسین کوڕی عەلی ئاگادار کردەوە. ئەمە لەسەر بنەمای گێرانەوەی کەسێك راستە که دەلێت: دایکی سەلە دوای کوژرانی حسین مرد.

کوڕی زیاد دوای گەڕانەوەی عومەر کوڕی سەعد لەنەینەوا بۆ کوشتنی حسین کوڕی عەلی، پێی وت: ئەی عومەر، ئەو نامەی فەرمانی کوشتنی حسینمان تیا نوسیبو، بیگەڕێنەوە. عومەر وتی: بۆ کارێك ڕۆشتم و لەدەستم کەوتە خوار و لەناوچو. وتی: بیهێنە. وتی: ونبو. وتی: دەبێت بیهێنیت. وتی: بەجێم هێشت کە سوێند بەخوا ئەمرۆ پیرێژنەکانی قورەیش لەمەدینە دەیخوێنن تا بەداوای لێخۆشبونی من رازی ببن (خۆم نەمکرد بەلکو بەفەرمانی تۆ کردم). سوێند بەخوا سەبارەت بەحسین ئامۆژگاری تۆم کرد کەنەگەر بۆ باوکم سەعد کوڕی وەقاصم کردبو، ماق خۆییم پێ بەخشیبو. عوسمان کوڕی زیاد برای عوبەیدالله کوڕی زیاد وتی: سوێند بەخوا، راست دەکات. حەزم دەکرد لەلوتی هەمو پیاوانی بنەماڵەی زیاد، تا رۆژی هەستانەوە، لوت بەندێکی چەرمین دەبو و حسین نەدەکوژرا. کوڕی زیاد وەك پشت راست کردنەوە، سەری تەکاندا (بەلام کوڕی زیاد هیچ کات عومەر کوڕی سەعدی بۆ فەرمانڕەوایی رەوانە نەکرد).

کۆتایی داستانی کوژرانی حسین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب.

## کوژرانی ئەبو بیلالی مێرداس کوڕی حەدیری حەنزەلی

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە هۆکاری شۆڕشەکەی ئەو چی بو و کوڕی زیاد بەچ شێوەیەك دو هەزار شەڕکەری بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد. هەر دوو لای شەڕکەر لەئاسك روبەروی یەك بونەوە و سوپاکەی کوڕی زیاد شکستیان خوارد. کاتێك ئەبوبیلال ئەوانی شکستدا و ئەم هەواڵە بەگوێی کوڕی زیاد گەیشت، سێ هەزار پیاوی شەڕکەری بەفەرماندەیی عەباد کوڕی ئەخزەر ڕەوانە کرد. ناوی تەواوی ئەو عەباد کوڕی عەلقەمە کوڕی عەبادی تەمیمی بو. عەباد شوێنی ئەبو بیلال کەوت تا لەتوج پێیگەیشت. عەباد ریزی بەست و ئەبوبیلال هێرشی کردە سەر. ئەوان خۆڕاگریان کرد و شەڕ روی لەدژواری کرد تا ئەوەی کاتی نوێژی نیمەڕۆ گەیشت. ئەبوبیلال وتی: ئەمڕۆ هەینیە و ڕۆژێکی بەرێز و پیرۆزە و ئێستا کاتی نوێژە. دەستمان لێ هەڵبگرە تا نوێژ بخوێنین. کوڕی ئەخزەر رازی بو و دو سوپا لەیەك جیا بونەوە. کوڕی ئەخزەر بەخێرایی نوێژەکەی تەواو کرد و بەوتەی هەندێ کەس نیوەناچڵ وازی لێ هێنا و خەواریج سەرقاڵی نوێژخوێندنی خۆیان بون. کوڕی ئەخزەر و هاورێکانی هێرشیان کردە سەریان و ئەوان راوەستاو یا سوجدە یا رکوعیان دەبرد و هیچ کام دەستیان لەنوێژەکەیان هەڵنەگرت. هەمویان تا دوایین کەس کوژران و سەری ئەبوبیلالیان بڕی.

عەباد کوڕی عەلقەمە بۆ بەسرە گەڕایەوە و لەوێ عوبەیدە کوڕی هیلال لەگەڵ سێ کەسی تر لەسەر ڕێگەکەی دانیشتن. عەباد هات و روی کردە کۆشکی فەرمانداری و کوڕە بچوکەکەی خۆی لەدواوە سوار کردبو. وتیان: بۆستە و پرسیارێکی دینیمان لەتۆ هەیە. وەستا. وتیان: چوار براین کە یەکێك لەئێمەیان بەستەم کوشتوە، چی لەم کارەدا دەبینیت؟ وتی: دادخوازی بۆ لای فەرماندار ببەن. وتی: ئەو کارەمان کرد بەڵام هیچی بۆ نەکردین. وتی: بیکوژن خوا بیکوژێت، هێرشیان کردە سەر و وتەی خەواریجیان هێنایە سەرزمان (فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا) عەباد کوڕەکەی دورخستەوە کە رزگاری بو و خۆی کوژرا. خەڵك هێرشیان کردە سەر خەواریج و ئەوانیان کوشت بەڵام عوبەیدە کوڕی هیلال رزگاری بو.

کاتێك کوڕی عەباد کوژرا، کوڕی زیاد لەکوفە بو و جێگرەکەی عوبەیدالله کوڕی ئەبی بەکرە فەرمانڕەوایەتی بەسرەی دەکرد. کوڕی زیاد نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا

شوێن خەواریج بکەوێت. ئەو فەرمانەکەی جێبەجێ کرد و دەستی بەگرتنی ئەوان کرد. ئەگەر سەبارەت بەکەسێك نێوەنجیگەریان دەکرد، کەسێکی دەکردە دەستەبەر تا کوڕی زیاد بگەرێتەوە. هەر کەسێك دەستەبەری نەبوایە، دەکەوتە زیندانەوە. عوروە کوڕی ئودیەیان بردە لای کەئازادی کرد و وتی: خۆم دەبمە دەستەبەری تۆ. کاتێ کوڕی زیاد گەڕایەوە، خەواریجە زیندانیەکانی هێنایەدەر و کوشتی و فەرمانی بەدەستەبەرەکان دا ئەو کەسانە بێنن کە بونەتە دەستەبەریان، هەر کەسێك کەسێکی لەخەواریج هێنا، خۆی ئازاد کرد و کەسی خەواریجی کوشت و ئەو کەسەی کەسی نەهێنا، خۆی سەربڕا. دواتر عوبەیداللە کوڕی ئەبی بەکرەی لەبەرابەر عوروە کوڕی ئودیە گرت. وتی: دەستم بەو ناگات. وتی: خۆت دەکوژم. عوبەیداللە شوێنی کەوت و سەرئەنجام دۆزیەوە و بردیە لای کوڕی زیاد. کوڕی زیاد پێی وت: بێ گومان لەت لەتت دەکەم. دوبارە پێی وت: حەزت لەچ کوشتنێکە، خۆت هەڵیبژێرە. عوروە وەلامی نەدایەوە و کوڕی زیاد فەرمانیدا هەردودەست و قاچیان بڕیەوە و ئەویان لەداردا. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٥٨/ ٦٧٧-٦٧٨ زایینی کوژرا.

## فەرمانڕەوایی سەلم کوڕی زیاد لەخوراسان و سیستان

دەڵێن: لەم ساڵەدا یەزید، سەلم کوڕی زیادی کردە فەرمانڕەوای خوراسان.
هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە سەلم هاتە لای یەزید کەپێی وت: ئەی باوکی حەرب، تۆ دەکەمە فەرمانڕەوای ناوچەی فەرمانڕەوایی براکانت عەبدولرەحمان کوڕی زیاد و عەباد کوڕی زیاد. وتی: ئەوەی سەروەری باوەڕداران، بخوازێت، پێی رازیم. یەزید ئەوی کردە فەرمانڕەوای خوراسان و سیستان. سەلم، حارس کوڕی معاویەی حارسی باوەگەورێی عیسا کوڕی شەبیبی رەوانەی خوراسان کرد و خۆی ڕۆشتە بەسرە و لەوێ سامان وپێویستیەکانی هەڵگرت و براکەی یەزید کوڕی زیادی رەوانەی سیستان کرد. عوبەیدالله کوڕی یەزید نامەی بۆ براکەی نوسی و ئاگاداری کردەوە کە سەلم کوڕی زیاد بۆتە فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە. عەباد هەمو سامانی گەنجینەی بەسەر کۆیلەکانی خۆی دابەش کرد و شتێك مایەوە و لەناو خەڵکدا جاڕیدا: هەر کەس دەوێت بەشی خۆی لەپێشەوە وەربگرێت، با بێت. هەر کەسێك هات، بەشی خۆی پێبەخشی. عەباد کوڕی زیاد لەسیستان ڕۆشتەدەر. کاتێك گەیشتە جیرۆفت، ئاگاداریان کردەوە کە سەلم کوڕی زیاد لەکوێیە. لەنێوان ئەم دوانەدا کێوێك بو. عەباد لەوێوە رێگای خۆی گۆڕی. لەو شەوەدا هەزار کۆیلە لەکۆیلەکانی عەباد کوڕی زیاد هاتنەدەر و ڕۆشتن و هەر کام، لانی کەم، دەههەزار درەمیان پێبو. عەباد کوڕی زیاد لە پارس تێپەڕی کرد و ڕۆیشتە لای یەزید کوڕی زیاد. سەبارەت بەسامانەکەی پرسیاری لێکرد. عەباد وتی: فەرمانداری سنور بوم و ئەوەی بەدەستم هێنا، لەناو خەڵکدا دابەشم کرد.
کاتێك سەلم بەرەو خوراسان بەرێکەوت، یەزید کوڕی معاویە هاورێ لەگەڵ ئەو نامەیەکی بۆ براکەی عوبدیالله کوڕی زیاد نوسی کە شەش هەزار یا دو هەزار سوارەی بۆ ئامادە بکات. سەلم بەردەوام گەورەکانی خەڵکی هەڵدەبژارد. ئەم کەسانە لەگەڵ ئەو ڕۆشتن: عیمران کوڕی فوزەیلی بورجومی، موهەلیب کوڕی ئەبی سوفرە، عەبدالله کوڕی خازمی سولەمی، تەڵحە کوڕی عەبدالله کوڕی خەلەف خوزاعی، حەنزەلە کوڕی عەرادە، یەحیا کوڕی یەعمەری عەدەوانی و صەلە کوڕی ئەشیمی عەدەوی و چەند کەسێکیتر.
سەلم کوڕی زیاد بەرەو خوراسان بەرێکەوت و ئازایانە لەروبار پەڕیەوە. فەرمانداڕانی خوراسان پێش ئەو شەڕیان دەکرد و کاتێك زستان دەهات، بۆ مەروی شاجەهان

دەگەڕانەوە. کاتێك موسوڵمانان دەگەڕانەوە، پاشاکانی خوراسان لەشارێکی نزیك خوارزەم کۆدەبونەوە و پەیمانیان دەبەست شەڕی یەکتر نەکەن و لەکاروبارەکاندا راوێژ بەیەکتر بکەن. موسوڵمانان داوایان لەفەرماندارەکانی خۆیان دەکرد شەڕی ئەو شارە بکەن بەڵام ئەوان بەم کارە رازی نەدەبون. کاتێك سەلم گەیشت، بۆ شەڕ بەرێکەوت و لەیەکێك لەشەڕەکانی خۆی زستانی لەو ناوچەیە بەسەر برد. موهەلیب کوڕی ئەبی سوفرە لەبەرابەر ئەو پێداگری کرد و داوای لێکرد خۆی بۆ شەڕی ئەم شارە ئامادە بکات. سەلم ئەوی لەگەڵ شەش هەزار یا چوار هەزار شەرکەر رەوانە کرد کەگەمارۆیان خستە سەر خەڵکەکەی. ئەوان لەسەر ئەم بنەمایە پێشنیاری ئاشتیان کرد کە گیانی خۆیان بکرنەوە. ئەو رازی بو. لەسەر بنەمای بیست و چەند هەزار درەم ئاشتیان لەگەڵ کرد. لەپەیمانی ئاشتیەکەدا نوسرابو کە کالآیان لێ وەربگرن. ئەو چوارپێ و مەر و ماڵآتی بەنیوە بەها لەوان وەردەگرت. بەهای ئەوەی لەوانی وەرگرت، بەپەنجا هەزار هەزار درەم خەملێنرا. لەم رێگەوە، موهەلیب لای سەلم پێگەیەکی بەرزی دەست کەوت و لەدڵی ئەودا جێگەی بویەوە. سەلم ئەوەندە سامانی تالآنی دەست کەوت کە پێی سەرسوڕماو و شادمان بو. سامانەکەی بۆ لای یەزید کوڕی معاویە رەوانە کرد.

سەلم شەڕی لەسەمەرقەند دەست پێکرد و هاورێ لەگەڵ خۆی ژنەکەی لەروبار تێپەڕی: دایکی محەممەدی سەقەفی کچی عەبدالله کوڕی عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص. ئەو یەکەم ژنی عەرەب بو لەروبار تێپەڕی. کورێکی بۆ هێنایە دونیا کە ناویان نا سوغدی کوڕی سەلم کوڕی زیاد. ژنەکەی خشڵ و زێرەکانی ژنی فەرمانداری سوغدی بەقەرز وەرگرت و بردی و بۆی نەگەڕاندەوە. ئەو سوپایەکی بۆ شەڕی خەجندە رەوانە کرد کە ئەعشی هەمەدان لەناویاندا بو. ئەوان لەخەجندیەکان شکستیان خوارد و ئەعشی وتی:

| | |
|---|---|
| لیت خیلی یوم الخجندة لم تهـ | ـزم و غودرت فی المکر سلیبا |
| تحضر الطیر مصرعی و تروحـ | ـت الی الله بالدماء خضیبا |

یانی: خۆزگە سوارەکانی من لەشەڕی خەجندە شکەستیان نەدەخوارد و من لەکاتی هێرش کردن دەکەوتمە سەر رێگەیەکیتر. خۆزگە باڵندەکان هێرشیان دەکردە سەر کوشتنگەکەی من و من خوێناوی دەڕۆشتمە دیداری خواوەند.

## فەرمانداری یەزید کوڕی زیاد و تەڵحەی تەڵحات لەسیستان

کاتێك یەزید کوڕی معاویە، سەلم کوڕی زیادی بۆ خوراسان دەست نیشان کرد، براکەی یەزید کوڕی زیادی کردە فەرمانڕەوای سیستان. خەڵکی کابول ئاشتی نامەکەی خۆیان پشت گوێ خست و ڕێگەی پەیمان شکێنیان گرتەبەر و ئەبو عوبەیدە کوڕی زیادیان بەئەسیری گرت. یەزید کوڕی زیاد لەگەڵ سوپایەکی تەیار بۆ شەڕی ئەوان بەرێکەوت کە شەڕیان تاقی کردەوە و موسوڵمانان شکستیان خوارد و بەسەختی کوشتار کران. لەناو کوژراوەکان، یەزید کوڕی عەبدالله کوڕی ئەبی مولەیکە و صیلە کوڕی ئەشیم ئەبو سەهبای عەدەوی هاوسەری موعازە عەدەوی دەبینران. کاتێك ئەم هەواڵە بەسەلم کوڕی زیاد گەیشت، تەڵحە کوڕی عەبدالله کوڕی خەلەفی خوزاعی ناسراوی بەناوی تەڵحەی تەڵحات ڕەوانە کرد. ئەو ئەبو عوبەیدەی بەپێنسەد هەزار دەرەم کڕیەوە و تەڵحە لەکابولەوە بەرەو سیستان بەرێکەوت وبو بەفەرمانداری ئەو ناوچەیە. سامانی زۆری کۆکردەوە و بەخەڵکانی دەبەخشی. لەسیستان مرد وپێش مردن پیاوێکی لەبەنی یەشکر کردە جێگری خۆی. موزەرییەکان ئەویان دەرکرد و دوبەرەکی لەناو عەرەبەکان دروست بو و ڕەتبیل چاوی تەماحی لەو دیارە بڕی.

## لەسەر کارلابردنی عەمرۆ کوڕی سەعید

**فەرمانڕەوایی وەلید کوڕی عوتبە لەمەدینە**

دەڵێن: لەمساڵەدا یەزید کوڕی معاویە، عەمرۆ کوڕی سەعیدی لەمەدینە لابرد و وەلید کوڕی عوتبەی کردە فەرمانڕەوا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە عەبدالله کوڕی زوبەیر کوڕی عەوام ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە گرتەبەر و دوای کوژرانی حسین لەخەڵکی مەککە بەیعەتی بۆ خۆی وەرگرت. چۆنیەتی ئەوەی کە: کاتێك هەواڵی کوژرانی حسینی پێگەیشت، لەناو خەڵکدا وتارێکی پێش کەش کرد و کوژرانی ئەوی بەگەورە و خەڵکانی کوفە بەتایبەت و عێراقیەکانی بەشێوەیەکی گشتی سەرکۆنە کرد. دوای ئامازەدان بەناوی خواوەند و سوپاس کردن و ناردنی سلاو بۆ محەممەد، وتی: عێراقیەکان پەیمان شکێنانی خراپەکارن و کوفیەکان لەوان خراپتر جگە لەدەستەیەکی کەم لەوان کە ئەم وتانە

نایانگرێتەوە. ئەوان حسینیان بانگ کرد تا هاوکاری بکەن و بیکەنە فەرمانڕەوای خۆیان، بەڵام کاتێك گەیشتە لای ئەوان، دژی ئەو شۆڕشیان کرد و وتیان: یا دەست دەخەیتە ناو دەستی ئێمە تا تۆ ببەینە لای کوڕی زیاد، تا سەبارەت بەچارەنوسی تۆ فەرمان دەردەکات، یا شەڕت لەگەڵ دەکەین. سوێند بەخوا دەیزانی خۆی و هاوەڵانی لەبەرابەر ئەو سوپا گەورەیە کەمن. خوا لەنیهێنیەکان کەس ئاگادار ناکاتەوە کە دەکوژرێت یا نە. بەڵام حسین کوژرانی پیاوانەی پێ باشتر بو لەژیانی ریسوایانە. خوا لەحسین خۆش ببێت و بکوژەکەی ریسوا بکات. سوێند بەگیانی خۆم، هەرچەندە رێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەویان گرتەبەر و سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان کرد، ئەوان کەسێکی ئامۆژگاریکەری وەك ئەویان دەست ناکەوێت. بەڵام ئەوەی دەبێت، روبدات، بەناچاری رودەدات و ئەگەر خوا بیەوێت کارێك بکات، کەس ناتوانێت رێگری لێ بکات. ئایا دوای حسین دەتوانین پشت بەم خەڵکانە ببەستن و وتەکانیان بەراست بزانین و بەپەیمانەکەی ئەوان رازی ببین؟ سوێند بەخوا ئەوان بۆ ئەم کارە بەشیاو نازانین. سوێند بەخوا پیاوێکیان کوشت کە شەوانە درەنگ دەخەوت و نوێژی دەخوێند و زۆربەی رۆژەکان بەرۆژو دەبو. ئەو بۆ ئەوەی ئێستا لەدەستیاندایە، شیاوتر و لەئایین و دینداری لەپێشتر وباشتر بو. سوێند بەخوا ئەو قورئانی بەگۆرانی خوێندن نەدەگۆڕیەوە و گریان لەترسی خوای بەگۆرانی وتن نەدەفرۆشت و بادەخۆری لەجیاتی رۆژو گرتن هەڵنەدەبژارد و دوعا و پاڕانەوەی لەبەر راو کردن پشت گوێ نەدەخست. (بەخێرایی ئەوان گرفتاری ریسوایی و گومڕایی دەبن) مریەم/ ٥٩/١٩.

هاورێکانی هەڵخرێنران و رۆشتنە لای و پێیان وت: بەیعەتی خۆت ئاشکرا بکە چونکە لەبەر ئەوەی حسین کوژراوە، کەس لەم کارەدا کێبڕکێ لەگەڵ تۆ ناکات. ئەو بەنهێنی بەیعەتی وەردەگرت و بەو شێوەی نیشان دەدا کە پەنای بۆماڵی خوا بردوە. بەوانی وت: پەلە مەکەن. فەرمانداری مەککە لەو کاتەدا عەمرۆ کوڕی سەعید بو. ئەو سەختگیرترین کەس بۆ کوڕی زوبەیر بو. لەگەڵ ئەوەیشدا، رێگەی سازگاری و میهرەبانی لەگەڵ دەگرتەبەر. کاتێك یەزید زانی کوڕی زوبەیر دەستەیەکی لەمەککە لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە، سوێندی خوارد زنجیر لەدەست و قاچی بکات. لەبەر ئەمە زنجیرێکی زیوینی بە کوڕی عەتای ئەشعەری و سەعد و هاورێکانی ئەوان رەوانە کرد تا بەوە

بیبەستنەوە و ڕەوانەی لای یەزیدی بکەن. عابایەکی لەهەوریشم بۆ نارد تا بیپۆشێت بۆ ئەوەی خەڵك نەزانێت ئەو گیراوە.

کوڕی عەتل لەمەدینە تێپەڕی کە مەروان کوڕی حەکەم لەوێ بو. ئاگاداری کردەوە کە بۆ چ مەبەستێك هاتوە. مەروان دو کوڕ لەکوڕەکانی خۆی لەگەڵ ڕەوانە کرد کەیەکیان عەبدولعەزیز کوڕی مەوران بو. وتی: کاتێك نێردراوەکانی یەزید دەگەنە لای، ئێوە بەشێوەیەك لای ئەو تێپەڕن و یەکێکیتان ئەم هۆنراوەیە بخوێنێتەوە:

فخذها فليست للعزيز بخطة و فيها فعال لامرى متذلل

اعامر ان القوم ساموك خطة و ذلك فلا الجيران غزل بمغزل

اراك اذا ما كنت للقوم ناصحا يقال له بالدلو ادبر و اقبل

یانی: ئەمە بگرە کە بۆ ڕێزدار کارێکی دژوار نیە و لەوەدا بۆ خەڵکێکی دەستەمۆ و ملکەچ، کارێکی شیاوی باس کردنە. ئەی عامر، ئەم خەڵکە بەڵایەکی گەورەیان بەسەرتۆدا هێنا و ئەم کردارە لەناو دراوسێکان، هاوشێوەی ڕستنە بەدوکێکی هاوسازی چەرخ. دەبینم کاتێك دەتەوێت چاکە لەگەڵ ئەم خەڵکەدا بکەیت، فەرمانت پێ دەدەن: بەگۆزەوە بۆ پێشەوە بڕۆ و جارێکیتر بگەڕێرەوە.

کاتێك نێردراو و نامەکە بەدەستی گەیشت، عەبدولعەزیز هۆنراوەکەی خوێندەوە. کوڕی زوبەیر وتی: ئەی بەنی مەروان، ئەوەی وتتان، بیستم. ئێستا ئەم پەیامە بۆ باوکتان ببەن:

انى لمن نبعة مكاسرها اذا تناوحت القصباء و العشر

فلا الين لغير الحق اساله حتى يلين لضرس الماضغ الحجر

یانی: من لەڕەگی دارێکی ڕەق و سەختم و ئەمە لەکاتێکدایە قامیشەڵان ڕوبەڕوی چنارستان دەبێتەوە. من جگە لەبەرابەری خوا نەرمی لەخۆم نیشان نادەم و جگە لەو داوای هیچ لەکەس ناکەم. نەرم نیم بەهەمان شێوە کە بەرد لەژێر دیان، نەرمی نانوێنێت.

کوڕی زوبەیر لەفەرمانی یەزید و نێردراوەکانی خۆی بەدور گرت. وەلید کوڕی عوتەبە و چەند کەسێکیتر لەئومەوییەکان بەیەزیدیان وت: ئەگەر عەمرۆ بیەوێت، دەتوانێت کوڕی زوبەیر دەستیگر بکات و ڕەوانەی دەرباری تۆی بکات. عەمرۆ لەسەر کار لابرا و

وەلید بو بەفەرمانڕەوای حیجاز. وەلید کۆیلەکان و خزمەکانی عەمرۆ کوڕی سەعیدی گرت و زیندانی کردن. عەمرۆ قسەی لەگەڵ کرد و ئەو ئامادە نەبو ئازادیان بکات. ئەو لەمەدینە ڕۆشتەدەر و دو شەو ڕێگەی بڕی و دواتر بەژمارەی کۆیلەکانی خۆی وشترە سوارەکانی رەوانە کرد کە دەرگای زیندانەکەیان تێکشکاند و ئەوانیان ئازاد کرد و لەکاتی گەیشتنی ئەو بۆ شام پەیوەستی بون. ئەو ڕۆشتە لای یەزید و لەفێڵەکەی کوڕی زوبەیر ئاگاداری کردەوە کە یەزید بەداوای لێخۆشبونەکەی رازی و بەراستگۆ لەقەڵەمیدا.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

## لەم ساڵەدا وەلید لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

فەرمانداری عێراق عوبەیداللە کوڕی زیاد، خوراسان سەلم کوڕی زیاد، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە شورەیح و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە هشام کوڕی هوبەیرە بو.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: عەلقەمە کوڕی قەیسی نەخەعی هاوڕێی عەبدالله کوڕی مەسعود کە دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٢/ ٦٨١- ٦٨٢ زایینی مرد و نەوەد ساڵ تەمەنی بو. مونزەر کوڕی جارودی عەبدی، جابر کوڕی عەتیکی ئەنساری کە هەندێ کەس بە حوڕ ناوی دەبەن و نەوەد ویەك ساڵ ژیا و لەبەدریەکان بو، حەمزە کوڕی عەمرۆ ئەسلەمی لەنەوەد و یەك یا هەشتا ساڵی کە چاوی بەپێغەمبەر کەوتبو، خالید کوڕی عورفەتەی لەیسی یا عوزری هاوپەیمانی بەنی زوهرە کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٠/ ٦٨٠ زایینی مرد. ئەو چاوی بەپێغەمبەری خوا کەوتبو.

## ړوداوەکانی ساڵی شەست و دوی کۆچی( ٦٨١ – ٦٨٢ )

## ڕۆشتنی دەستەی نوێنەرایەتی مەدینە بۆ شام

کاتێك وەلید بو بەفەرمانڕەوایی حیجاز، بەردەوام هەوڵی دەدا لەکاتێکی لەناکاو و لەبێ ئاگایی عەبدالله کوڕی زوبەیر بەسەر ئەودا زاڵ ببێت، بەڵام ئەو بەردەوام بەهێز و پارێزراو بو. کاتێك حسین کوژرا، نەجدە کوڕی عامری نەخەعی لەیەمامە شۆڕشی کرد و کوڕی زوبەر بزوتنەوەکەی لەحیجاز دەست پێکرد. وەلید لەعەرەفات دەهاتە خوار و بەرێدەکەوت و خەڵك لەگەڵ ئەو ڕێگەیان دەبڕی. کوڕی زوبەیر لەشوێنەکەی خۆی وەستابو. دواتر کوڕی زوبەیر لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی و نەجدە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بەرێدەکەوتن. نەجدە چاوی بەکوری زوبەیر کەوت و گفتوگۆ لەنێوان ئەوان درێژەی کێشا تا ئەو رادەی خەڵك گومانیان دەکرد بەزویی لەگەڵ عەبدالله کوڕی زوبەیر بەیعەت دەکات. دواتر کوڕی زوبەیر فێڵی لەکاروباری وەلید کرد و نامەیەکی بۆ یەزید نوسی: تۆ پیاوێکی نەزان و گێژت روانە کردوە کە نەبۆ ڕێگەی راست ڕێنوێنی دەکرێت ونەگوێ لەئامۆژگاری فرەزانەکان دەگرێت. ئەگەر پیاوێکی روخۆش رەوانە بکەیت، هیوادارین ئەوەی لەکاروبارەکان روی لەدژواری کردوە، ئاسان ببێتەوە و ئەوەی بڵاوبۆتەوە، کۆببێتەوە.

یەزید وەلیدی لەسەر کار لابرد و عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی سوفیانی وەك فەرماندار دەست نیشان کرد. ئەو گەنجێکی کەم تەمەن و لەخۆبایی بو کە ئەزیانێکی زۆری تێپەڕاندبو تا ئەزمون بەدەست بێنێت نە کارێکی ئەنجامدابو، تا ئەزمونی لێ وەربگرێت. گرنگی بەو کارانە نەدەدا کە لەژێر فەرمانی ئەودابو و روبەروی دژواریەکان نەدەبویەوە. وەلید دەستەیەکی لەخەڵکانی مەدینە بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای یەزید رەوانە کرد کە لەناویان حەنزەلە (شۆردراو بەدەستی فریشتەکان) و عەبدالله کوڕی ئەبی عەمرۆ کوڕی حەفص و موغەیرەی مەحزومی و مونزەر کوڕی زوبەیر و کەسانێکیتر لەگەورەکانی مەدینە دەبینران. ئەوان ڕۆیشتنە لای یەزید و یەزید ڕێزی لێگرتن و چاکەی لەگەڵ کردن و بەخششی فراوانی بەوان بەخشی. بەعەبدالله کوڕی حەنزەلە کە پیاوێکی بەرێز و گەورە و زانا و سەروەر و خواپەرەست بو، سەد هەزار

درەمی بەخشی. ئەو هەشت کوڕی بو کە بەهەرکام دەهەزار درەمی بەخشی.
کاتێك گەڕانەوە، هەمویان هاتنەوە بۆ مەدینە جگە لەمونزەر کوڕی زوبەیر کەڕۆشتە عێراق بۆ لای کوڕی زیاد. کاتێك دەستەی نوێنەرایەتی گەیشتە مەدینە، ئەو کەسانەی لەناو دەستەکەدا بون، لەناو مەدینە هەستان و بەشێوەیەکی ئاشکرا سەرکۆنەی یەزیدیان کرد و جوێنیان پێدا و وتیان: لای پیاوێك دەگەڕێینەوە کەهیچ ئایین و دینێکی نیە، شەراب دەخوات، تەپڵ دەژەنێت، کەنیزەکان گۆرانی بۆ دەڵێن. دزەکان و حەسحەسەکان شەوان لای ئەو کۆدەبنەوە و ئەو رۆژگاری بەسەگبازی بەسەردەبات. جێگری پێغەمبەری خوا ئێستا کەسێکە شەرابخۆری مێبازی خراپەکار و رەزا قورس. شایەتی دەدەین کە ئەومان لەفەرمانڕەوایی موسوڵمانان دور خستۆتەوە.
عەبدالله کوڕی حەنزەلە هەستا و وتی: لای پیاوێك دەگەڕێمەوە کە ئەگەر جگە لەم کوڕانەم کەسیتر هاورێم نەبێت، شەڕی لەگەڵ دەکەم. ئەو سامانی بەمن بەخشی و رێزی لێگرتم بەلاّم من بەسامانەکە رازی نەبوم مەگەر ئەوەی خۆمی پێ بەهێز بکەم. دواتر خەڵك یەزیدیان لەسەر کار لابرد و لەگەڵ عەبدالله کوڕی حەنزەلە لەسەر بنەمای شەڕ لەگەڵ یەزید بەیعەتیان بەست و ئەویان وەك فەرمانڕەوایی خۆیان دەست نیشان کرد.
بەلاّم مونزەر کوڕی زوبەیر، ڕۆشتە لای کوڕی زیاد کە چاکەی لەگەڵ کرد و رێزی لێگرت. ئەو لەهاورێکانی زیاد بو. کاتێك هەواڵی کاروباری مەدینە بەیەزید گەیشت، نامەیەکی بۆ کوڕی زیاد نوسی و فەرمانی پێدا مونزەر بخاتە زیندانەوە. کوڕی زیاد پەسەندی نەکرد ئەو کارە بکات چونکە مونزەر میوانی خۆی و هاورێی باوکی بو. ئەوی بانگ کرد و لەنامەکە ئاگاداری کردەوە و پێی وت: کاتێك خەڵك لای من کۆدەبنەوە، هەستە و بڵێ: فەرمانێکم پێ بدە تا بۆ شارەکەی خۆم بگەڕێمەوە. کاتێك دەڵێم: لای ئێمە بمێنەرەوە چونکە لێرە رێزت لێدەگرین و لەپێشیت پێ دەبەخشین، بڵێ: کارێکم هەیە و بەناچار دەبێت بگەڕێمەوە. لەو کاتەدا من فەرمانت پێ دەدەم تا بۆ لای کەس و کار و بنەماڵەکەت بگەڕێیتەوە.
کاتێك خەڵك لای کوڕی زیاد کۆبونەوە، مونزەر ئەو کارەی کرد و کوڕی زیاد فەرمانی گەڕانەوەی پێدا. ئەویش لەمەدینە هاتە ریزی ئەو کەسانەی خەڵکیان دژی یەزید هاندەدا. وتی: یەزید سەد هەزار درەمی بەمن بەخشی بەلاّم ئەو بەخشینە، نابێتە رێگر

لەوەی ئێوە لەچۆنیەتی کارەکانی ئەو ئاگادار نەکەمەوە. سوێند بەخوا ئەو شەراب دەخوات، سوێند بەخوا ئەوەندە مەست دەبێت کە نوێژ لەبیر دەکات. سەرکۆنەی یەزیدی کرد بەهەمان شێوە کەهاوەڵانی ئەو کارمیان کردبو. لەوان زیاتری وت و کارەکانی بەقێزەونتر لەقەڵەمدا. یەزید نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری رەوانە کرد و پێی وت: دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە خزم و کەس و کاری تۆن. هیچ شتێك نابێتە رێگر لەوەی دەیانەوێت و ئەگەر بەم کارە هەڵنەستن، خەڵك بۆ ناسازگاری لەگەڵ من بوێر نابن.

نەعمان بەرێکەوت و ڕۆشتە لای کەسەکانی خۆی وداوای لێکردن فەرمانبەر و ملکەچ بن و لەداوهاتەکانی ئاژاوە ئاگاداری کردنەوە. بەوانی وت: ئێوە توانای خۆڕاگری لەبەردەم خەڵکانی شامتان نیە. عەبداللە کوڕی موتیعی عەدەوی وتی: ئەی نەعمان چ شتێك ناچارت دەکات کە کاروباری رولەباش بونی ئێمە بەفیڕۆ بدەیت و کۆبونەوەکانی ئێمە پەرژ و بڵاو بکەیت. نەعمان پێی وت: لەئێستاوە تۆ دەبینم کاتێك سوپاییەکان هێرش دەکەنە سەر تۆ وبۆ شەڕ لەگەڵ ئێوە سوار ئەسپەکان دەبن و شمشێر بەسەر ناوچاوی ئەم خەڵکەدا دابارێت و ئاشی مەرگ لەناو دوسوپاکەدا دەست بەسوڕان بکات، سوار ئێسترەکەی خۆت دەبیت و بەرەو مەککە بەرێدەکەویت و ئەم داماوانە(ئەنساری مەدینە) بەجێدەهێڵیت تا لەناو گەرك و کۆڵان و مزگەوت و ماڵەکانیان کوشتار بکرێن. خەڵك گوێیان لەقسەکانی ئەو نەگرت، گەڕایەوە. بارودۆخ بەهەمان شێوە بو کە ئەو پێشبینی کرد.

## فەرمانداری دوبارەی عوقبە بە کوڕی نافع لەئەفریقیە

### وڵات گرتنەکانی لەوێ و کوژرانی

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە عوقبە لەفەرمانڕەوای ئەفریقیە لەسەر کار لابرا و بۆ شام گەڕایەوە. کاتێك گەڕایەوە بۆ لای معاویە، بەڵێنی پێدا دوبارە بۆ سەر کارەکەی بیگەڕێنێتەوە. معاویە مرد و عوقبە لەشام بو. یەزید لەم ساڵەدا ئەوی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقیە دەست نیشان کرد و بۆ ئەو دیارە رەوانەی کرد. ئەو ئازایانە هاتە قیروان و فەرماندارەکەی (ئەبو موهاجیری) بازداشت کرد و بەندێکی ئاسنی لەپێ کرد و لەقیروان سوپایەکی هاورێ لەگەڵ منداڵان و ژنان و سامانە تاڵانکراوەکان بەجێهێشت و زوهەیر کوڕی قەیسی بەلەوی وەك جێگری خۆی دەست نیشان کرد و

منالەکانی بانگ کرد و پێی وت: من گیانی خۆم بەخوا بەخشیوە و دەمەوێت تا کۆتایی ژیان لەگەڵ ناباوەڕان بەخوا شەڕ بکەم. پێشنیاری کرد دوای خۆی چیبکەن.

دواتر لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوت و ڕۆشتە شاری باغایە و بینی کە دەستەیەکی زۆر لەرۆمیەکان لەوێ کۆبونەتەوە. ئەوان بەسەختی شەڕیان لەگەڵ کرد و لەبەرابەر ئەو شکەستیان خوارد. عوقبە کوشتارێکی گەورەی لەناو ئەواندا دەست پێکرد و سامانێکی زۆری بەتالان برد. تێکشاوەکان رۆشتنە ناو شارەکە و ئەو گەمارۆی خستنە سەر. دواتر مانەوەی لەوێ پەسەند نەکرد و روی کردە سەرزەمینی زاب. ئەمە ناوچەیەکی زۆر بەربلاو بو کە شار و دێهاتی زۆری دەگرتەوە. ڕۆشتە ناو گەورەترین شاری کە (ئەرەبە)یان پێدەوت. رۆمیەکان و مەسیحیەکان لەوێ خۆیان حەشاردا و عوقبە گەمارۆی خستنە سەر. دەستەیەکیان بۆ کوێستانەکان رایان کرد. موسوڵمانان لەگەڵ دانیشتوانی شار لەمەسیحیەکان چەند جارێك شەڕیان کرد و سەرئەنجام مەسیحیەکان شکستیان خوارد و سەرکردەکان و سوارەکانیان کوژران. عوقبە کوڕی نافیع بۆ تاهێرت کۆچی کرد.

کاتێك ئەم هەواڵە بەرۆمیەکان گەیشت، داوای هاوکاریان لەبەربەریەکان کرد و ئەوانیش وەڵامیان دانەوە و هاوکاریان کردن و لەسوپایەکی گەورەدا کۆبونەوە. هەردولا روبەروی یەك بونەوە و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. بارودۆخ بۆ موسوڵمانان دژوار بو چونکە ژمارەی دوژمنەکانیان فراوان. دواتر خوای گەورە هاوکاری کرد و رۆمیەکان و بەربەریەکان شکستیان خوارد و هەڵاتن و شمشێری موسوڵمانان بەسەر ئەواندا دەستی بەبارین کرد و زۆریان لەوان کوشتار کرد و ژمارەیەکیان بەئەسیری وەرگرت و هەمو سامان و کەرەستەکانی شەڕیان وەك تالآنی هەڵگرتەوە.

لەسەر پێشڕەوی بەردەوام بو تا گەیشتە تانژە (تەنجە) و بەتریقی رۆم بەناوی یلیان چاوی پێی کەوت و دیاریەکی گرانبایی پێشکەش کرد و ملکەچی فەرمانەکانی بو. سەبارەت بەئاندۆلۆس پرسیاری لێکرد کە بەتریقی رۆم ئەو کارەی بەدژوار خستە بەرچاو. دوبارە سەبارەت بەبەربەریەکان پرسیاری لێکرد و بەتریق وتی: خەڵکانێکی فراوانن کە ژمارەکەیان تەنیا خواوەند دەیزانێت و ئەوان لەسەرزەمینی (سوسی نزیك)ن و ناباوەڕن و هێشتا بڕوایان بەئایینی مەسیحی نەهێناوە و مەزنی و شکۆ و ئازایەتی

تایبەت بەخۆیانیان هەیە.

عوقبە روی کردە سوسی خوارو لەخۆرئاوای تانژە. پێشەنگەکانی بەربەر روبەروی بونەوە و لەسوپایەکی گەورەدا شەڕیان لەگەڵ کرد. بەسەختی ئەوانی کوشتار کرد و سوارەکانی خۆی بۆ هەمو ئەو شوێنانە رەوانە کرد کە بەربەریەکان لەکاتی هەڵاتن رویان تێدەکرد تا گەیشتە سوسی سەرو و بینی کەبەربەریەکان بەسوپایەکی بێ ئەژمار بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو کۆبونەتەوە. روبەروی ئەوان بویەوە و شەڕی کرد و شکستی پێهێنان. موسوڵمانان لەکوشتنی ئەوان هیلاك بون و دەستەیەکی فراوانیان بەئەسیری گرت. بەرێکەوت تا گەیشتە مالیان و پانتاییەکانی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بینی. لێرەدا وتی: ئەی خوایە، ئەگەر ئەم دەریا نەدەبو، لەقوڵایی شارەکاندا پێشڕەویم دەکرد و لەپێناو تۆدا دەجەنگام.

دواتر گەڕایەوە و رۆمیەکان و بەربەریەکان لەسەر رێگەی ئەو ڕەمیان کرد چونکە لێی دەترسان. لەشوێنێك تێپەڕی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن (ئاوی ئەسپ). لەوێ دابەزی. لەو ناوچەیە ئاوی لێ نەبو و خەڵك بەسەختی گرفتاری تینویەتی بون و ئەوەندە نەمابو لەزیانەکەی لەناو بچن. عوقبە دو رەکعەت نوێژی خوێند و لەخوا پاڕایەوە. یەکێك لەئەسپەکانی بە سمکۆڵەکانی خۆی زەوی هەڵکۆڵی کە تاشەبەردێکی گەورە دەرکەوت و ئاو لەهەر چوار لاوە فیچقەی کرد. عوقبە لەناو خەڵك هاواری کرد کە وردە بەردەکانیان لابرد وئاوی زۆریان خواردەوە. لەبەر ئەمە ئەو ناوچەیە بەئاوی ئەسپ ناو دەبەن.

کاتێك گەیشتە شاری تەنجە، کە لەوێوە تا قیروان هەشت رۆژ رێگە بو، فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا دەستە دەستە بڕۆنە پێش و ئەمە لەبەر ئەوە بو بەهێز و دڵگرم بو و دەیزانی چ بەڵایەکی بەسەر دوژمندا هێناوە و کەس نەماوە تا لێی بترسێت. لەگەڵ دەستەیەکی کەم ڕۆشتە تەهودە تا بیپشکنێت. کاتێك رۆمیەکان ئەویان لەگەڵ ئەو دەستە کەمەدا بینی، چاوی تەماحیان تێبڕی و لەقەڵاکە خۆیان حەشاردا و جوێنبارانیان کرد و شەڕیان دەست پێکرد. ئەو پێشنیاری ئیسلامی پێکردن بەڵام رازی نەبون.

## شۆڕشی کوسەیلە کوڕی کەمرمی بەربەری دژی عوقبە

کوسەیلە کوڕی کەمرمی بەربەری باوەڕی بەئیسلام هێنابو و ئەمە لەکاتێکدا بو کە ئەبو موهاجیر وەك فەرمانڕەوای ئەفریقە دەست نیشان کرابو. ئەو لەگەورەکانی بەربەر و لەناودارترینی ئەوان بو. بو بەهاورێی ئەبو موهاجیر. کاتێك عوقبە هاتە سەر کار، ئەبو موهاجیر پێگەی کوسەیلەی پێ ناساند و فەرمانی پێدا رێزی لێ بگرێت. ئەو رازی نەبو و کوسەیلەی ریسوا کرد. دەستەیەك مەڕیان بۆ عوقبە هێنا. ئەو فەرمانی بەکوسەیلەدا سەڕیان ببڕێت و لەگەڵ ئەوکەسانی پێستیان لەمەڕەکان دادەماڵی، بەپێست داماڵین سەرقاڵ ببێت. کوسەیلە وتی: گەنج و کۆیلەکانی من بۆ ئەو کارە بەسن. عوقبە جوێنی پێدا و فەرمانی پێدا سەڕیان ببڕێت و پێستیان داماڵێت. ئەو کارەی کرد. ئەبو موهاجیر لای عوقبە سەرکۆنەی ئەم کارەی کرد. عوقبە لەکردارەکەی خۆی پەشیمان نەبویەوە. ئەبو موهاجیر پێی وت: من بازداشت بکە چونکە من لەو دەترسم و دەترسم زیانێك بەتۆ بگەیێنێت. عوقبە لەم کارەدا لاوازی لەخۆی نیشاندا. کوسەیلە رقی ئەوی لەدڵ گرت و بڕیاریدا لەناوی ببات. کاتێك رۆمیەکان دەستەیەکی کەمیان لەگەڵ عوقبەدا بینی، پەیك و پەیامیان بۆ لای کوسەیلە رەوانە کرد و لەم بارودۆخە ئاگاداریان کردەوە. ئەو لەناو سوپاکەی عوقبەدا بو و دەیویست تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئەو رۆمیەکانی لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار کردبویەوە. رۆمیەکان چاوی تەماحیان لەم بارودۆخە بڕی. کاتێك بۆ لای ئەو هاتوچۆیان دەست پێکرد، ئەوانی لەنهێنی دڵی خۆی ئاگادار کردەوە وکەسان و کوڕەمام و هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و مەبەستی عوقبەی کرد. ئەبو موهاجیر پێی وت: بەخێرایی گەمارۆی بدە پێش ئەوەی بتوانێت هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوە، هێرشی بکەسەر و لەناوی ببە. ئەبو موهاجیر بەندێکی ئاسنینی لەپێدا بو و هاورێیەتی عوقبەی دەکرد. عوقبە شەڕی لەگەڵ کوسەیلە دەست پێکرد. کوسەیلە رێگەی بۆ کردەوە تا سوپاکەی فراوان ببن. کاتێك کوڕی موهاجیر ئەمەی بینی، ئەم هۆنراوەی لەوتەی ئەبو میحجەنی سەقەفی وەك داستانێك هێنایە سەر زمان:

| | |
|---|---|
| کفي حزنا ان تمزع الخيل بالقنا | و اترك مشدودا على و ثاقيا |
| اذا قمت عناني الحديد و اغلقت | مصارع من دوني تصم المناديا |

یانی: ئەم ئەندازە لەخەم بەس کە ئەسپ و سوارکارەکان بەڕمەکان رو لەگۆڕەپان بکەن

و من لەهەڵبەز و دابەز دور کەوتبێتمەوە و بەند کراوبم. هەر جار کەدەمەوێت هەستم، ئاسن لەسەر زەوی دامدەنیشێنێت و دەرگاکانی زیندانێك بەرومدا ببەسترێن کە ئاوازدەر کەڕ دەکەن.

ئەم وتانە بەگوێی عوقەبە گەیشت و فەرمانیدا ئازادی بکەن. پێی وت: پەیوەستی موسوڵمانان ببە و کاروباری ئەوان رێکبخە چونکە من چاوەڕوانی گیان بەخشینم. ئەو نەیکرد و وتی: منیش خوازیاری گیان بەخشینم. عوقەبە هاورێ لەگەڵ موسوڵمانان کالآنی شمشێرەکانی خۆیان شکاند و رویان لەبەربەریەکان کرد و شەڕیان دەست پێکرد. موسوڵمانان هەمویان کوشتار کران ویەك کەس لەوان رزگاری نەبو. محەممەد کوڕی ئەوسی ئەنساری لەگەڵ دەستەیەکی کەم رزگاری بو. خواوەندی (قفصە) ئەوانی رزگار کرد و رەوانەی قیروانی کردن. زوهەیر کوڕی قەیسی بەلەوی بڕیاریدا شەڕ دەست پێ بکات. شەڕکەرە سەنعاییەکان سەرپێچی فەرمانەکەیان کرد و ئەو بۆ میسر گەڕایەوە. زۆربەی خەڵکەکەی بەدوای ئەودا بەرێکەوتن و زوهەیر ناچار بو لەگەڵ ئەوان بگەرێتەوە. ئەو ڕۆشتە بەرقە و لەوێ مایەوە.

بەلآم کوسەیلە، دوای ئەوە هەمو خەڵکی ئەفریقیە رەویان لەو کرد و ملکەچی فەرمانەکانی بون. ژنان و منالی موسوڵمانان و سامانە بەدەست هاتوەکان لەگۆڕەپانەکانی شەڕ لەم شارەدا کەڵەکە کرابون. ئەوان داوای ئەمانیان لەکوسەیلە کرد و ئەمانی پێبەخشین و ڕۆشتە قیروان و بەسەر ئەفریقیەدا زاڵبو و لەوێ مایەوە تا عەبدولەلیك کوڕی مەروان بەهێز بو. ئەو زوهەیر کوڕی قەیسی بەلەوی کە لەبەرەقە نیشتەجێ ببو، وەك فەرمانڕەوای ئەفریقیە دەست نیشان کرد.

## فەرمانڕەوایی قەیس لەئەفریقیە

## کوژرانی ئەو و کوژرانی کوسەیلە

کاتێك عەبدولمەلیك کوڕی مەروان هاتە سەر کار، ئاماژەیان بەموسوڵمانەکانی قیرواندا و هاورێکانی پێشنیاریان پێکرد سوپایەك بۆ ئەفریقیە رەوانە بکات و ژنان و منداڵانی موسوڵمان رزگار بکات. ئەو بۆ زوهەیر کوڕی قەیسی بەلەوی نامەی فەرمانداری ئەفریقیەی نوسی و سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد و لەساڵی ٦٩/ ٦٨٨ زایینی بەرەو ئەفریقیە بەرێکەوت.

هەواڵی ئەم کارە بەکوسەیلە گەیشت. ئەو سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و رازاندیەوە و رۆمیەکان و بەربەریەکانی یەکخست سەران و گەورەکانی لەناو هاوەڵانی خۆی بانگ کرد و پێی وتن: دەمەوێت بڕۆمە (ممش) چونکە لەقیروان دەستەیەکی فراوان لەموسوڵمانان ژیان بەسەر دەبەن و ئەوان لەگەڵ ئێمەدا پەیمانێکیان هەیە و باشترە رێز لەپەیمانەکەی خۆمان بگرین چونکە دەترسم ئەگەر شەڕ دەست پێبکەم و روبەروی زوهەیر ببینەوە، ئەوان لەپشتەوە هێرش بکەنە سەرمان بەڵام ئەگەر بچینە ممش و لەوێ دابەزین، ئاسودەبین و لەئارامیدا شەڕ لەگەڵ زوهەیر ئەزمون دەکەین. ئەگەر بەسەر ئەواندا سەرکەوتین، تا تەرابلۆس بەدوایاندا دەڕۆین و رەگ و ریشەی ئەوان لەئەفریقیە لەناو دەبەین. ئەگەر ئەوان سەرکەوتن، پەنا بۆ کوێستانەکان دەبەین و رزگارمان دەبێت. ئەوان بەپێشنیارەکەری رازی بون. ئەو بۆ ممش کۆچی کرد. هەواڵی ئەم کارەیان بەزوهەیر دا و لەڕۆشتن بۆ قیروان خۆی بەدور گرت و سێ رۆژ لەدەرەوە مایەوە تا خۆی و سوپاکەی حەوانەوە. دواتر شوێن کوسەیلە کەوت. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، دابەزی و هاورێکانی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و خۆی سوار بو. دو سوپا روبەروی یەك بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد و کوژراوان لەهەر دولا روی لەزیاد بون کرد بەشێوەیەك خەڵکان بەگشتی لەژیان هیوا بڕوا بون. بەشی زۆری رۆژیان بەمشێوەیە بەسەر برد. دواتر خوا هاوکاری موسوڵمانانی کرد و کوسەیلە و هاورێکانی گرفتاری شکەست بون و خۆی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکانی سوپاکەی کوژران و لەممش لەناوچون. موسوڵمانان شوێن رۆمی و بەربەریەکان کەوتن و هەر کەسێکیان گرت،

دەستبەجێ کوشتیان و لەکوشتندا سنورەکانیان بەزاند. لەم شەڕەدا بو کە رۆمیەکان و بەربەریەکان و پاشاکانی ئەوان لەناوچون و زوهەیر بۆ قیروان گەڕایەوە.

زوهەیر لەئەفریقیە سامانی فراوان و ژیانێکی بێ خەم پاشایەتی بەشکۆی پێبڕا بەڵام بڕیاریدا لەوێ نەمێنێتەوە. وتی: بۆ شەڕ لەڕێگەی خوا بۆ ئێرە هاتوم و دەترسم باوەش بۆ ئەم جیهانە بکەمەوە و لەناو بچم.

ئەو پیاوێکی خواپەرست و خۆپارێز بو. لەقیروان سوپایەکی ئاسودەی بەجێهێشت چونکە لەو سەرزەمینەدا نە دوژمنێکی دەبینی، نەپیاوێکی بەشکۆ و نە جموجوڵ لەکەسێك.

هەواڵ بەرۆمیەکانی کۆنستانتینۆپڵ گەیشت کە زوهەیر لەبەرقەوە مەبەستی ئەفریقیەی کردوە تا شەڕ لەگەڵ کوسەیلە بکات. ئەوان چۆڵ بونی ئەوشارەیان بەدەرفەت زانی و بەکەڵ و پەلی شەڕی دەریایی کەشتی زۆر و هێزی بێ ژمار لەدورگەی سیسیلەوە مەبەستی ئەویان کرد و هێرشیان کردە سەر بەرقە و ئەسیری زۆریان لەعەرەبەکان و بەعەرەب بوەکان گرت و کوشتار و تاڵانیان کرد. ئەمە هاوکات بو لەگەڵ هاتنی زوهەیر لەئەفریقیەوە و بەرەو بەرقە. ئەم هەواڵەیان پێ راگەیاند. فەرمانی بەسوپاکەیدا بەخێرایی غاربدەن و ئازایانەتر شەڕ بکەن. ئەو لەگەڵ هاورێکانی خۆی پێشڕەوی دەست پێکرد. سوپای رۆمیەکان فراوان و کاتێك موسوڵمانان ئەوانیان بینی، داوایان لێکرد پەشیمان ببێتەوە، بەڵام نەیتوانی بگەڕێتەوە و لەبەر ئەمە شەڕی دەست پێکرد و بارودۆخ روی لەدژواری کرد و چارەنوس زیانی بەرکەوت و رۆمیەکان سەرکەوتن و موسوڵمانان شکستیان پێبڕا. رۆمیەکان لەوان زۆرتر بون و زوهەیر و هاورێکانی کوژران و کەس لەوان بەزیندویی نەمایەوە. رۆمیەکان بەدەستی پڕ بۆ کۆنستانتینۆپڵ گەڕانەوە.

کاتێك عەبدولمەلیك لەهەواڵی کوژرانی زوهەیر ئاگادار بویەوە، ئەم کارەی بەدژوار زانی. دواتر حەسان کوڕی نەعمانی غەسانی رەوانەی ئەفریقیە کرد کە بەخواستی خوای گەورە لەروداوەکانی ساڵی ٦٩٣/٧٤ زایینی ئاماژەی پێدەدەین.

شیاو بو داستانی فەرمانڕەوای و کوژرانی زوهەیر کوڕی قەیس لەروداوەکانی ساڵی ٦٨٨/٦٩ زایینی ئاماژە پێ بدەین. لەبەر ئەوە لێرەدا ئاماژەمان پێدا چونکە بەسەرهاتی

کارەکانی ئەو پەیوەستە لەگەڵ کوژرانی کوسەیلە و چونکە روداوەکە یەکێکە، ئەگەر لێك جیا بکرێتەوە، هەست بەناوەرۆکەکەی ناکرێت.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

## لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عوتەبە لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس، باوکی (خوێنرێژ* (سەفاح) و مەنسور چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: عەبدولموتەلیب کوڕی رەبیعە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشمی هاشمی (لەئەنسار) مەسلمە کوڕی موخەلیدی ئەنساری کە لەرۆژی مردنی پێغەمبەر تەمەنی دە ساڵان بو، مەسروق کوڕی ئەجدەع لەمیسر کە دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٣/ ٦٨٢- ٦٨٣ زایینی مرد.

## روداوەکانی ساڵی شەست و سێی کۆچی( ٦٨٢ – ٦٨٣ زایینی )

### داستانی حورە

سەرەتای کاری حورە بەمشێوە بو کە یەزیدیان لەسەر کار لابرد و پێشتر ئاماژەمان پێدا. کاتێك ئەم ساڵە گەیشت، خەڵکانی مەدینە، عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی سوفیان، کارگوزاری یەزیدیان لەشارەکە دەرپەڕاند و گەمارۆیان خستە سەر ئومەوییەکان. ئەوان دەستی بەیعەتیان بۆ عەبدالله کوڕی حەنزەلە درێژ کرد. ئومەوییەکان وهاورێیان و کەسانی شوێنکەوتەی ئەوان، نزیکەی هەزار پیاو، هاتنەدەر و لەماڵی مەروان کوڕی حەکەم کۆبونەوە. نامەیان بۆ یەزید نوسی و داوای هاوکاریان لێکرد. نێردراو گەیشتە لای یەزید و ئەو لەسەر کورسی دانیشتبو و هەر دوقاچی خۆی خستبویە ناو تەشتێك ئاو چونکە گیرۆدەی نەخۆشی (نەقرس) لەهەردو قاچیدا بو. کاتێك نامەی ئومەوییەکانی خوێندەوە، ئەم هۆنراوەی وەك داستان هێنایە سەر زمان:

لقد بدلوا الحم الذی فی سجیتی فبدلت قومی غلظة بلیان

یانی: خۆڕاگری منیان گۆڕی و من لەجیاتی نەرمی، ڕێگەی توندوتیژیم لەگەڵ خەڵك گرتە بەر.

دواتر وتی: ئایا ئومەوییەکان هەزار پیاوی شەڕکەریان نیە؟ نێردراو وتی: سوێند بەخوا زیاتر. وتی: نەیانتوانی ماوەیەك لەرۆژ شەڕ بکەن!کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی سەعید ڕەوانە کرد و نامەکەی بۆ خوێندەوە و فەرمانی پێدا لەگەڵ خەڵك بەرێکەوێت. عەمرۆ وتی: من کار و سەرزەمینەکانم بۆ تۆ سەقامگیر و بەهێز کردبو، بەلام ئێستا کە خوێنی قورەیشیەکان لەسەرەوە دەبارێت، نامەوێت جڵەوی کاروبارەکان بگرمە دەست.

کەسی بۆ لای عوبەیدالله کوڕی زیاد ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا بۆ مەدینە بڕوات و گەمارۆ بخاتە سەر عەبدالله کوڕی زوبەیر. کوڕی زیاد وتی: بۆ پیاوێکی خراپەکار دو کار پێکەوە ئەنجام نادەم: کوشتنی کوڕی پێغەمبەری خوا و شەڕ لەشاری خوایی مەککە. دواتر کەسێکی ڕەوانە کرد و داوای لێبوردنی لەیەزید کرد.

یەزید کەسێکی بەدوای موسلیم کوڕی عوقبەی موڕی ڕەوانە کرد. پێیان دەوت (موسریف، ئەو کەسەی لەخوێن ڕشتن زێدەڕۆیی دەکات) و لەم کاتدا پیرە پیاوێکی

بەتەمەن و نەخۆش بو. نێردراو ئاگاداری کردەوە و موسلیم وتی: ئایا ئومەوییەکان هەزار پیاو نین؟ نێردراو وتی: زیاترن؟ وتی: ئەی بۆ نەیانتوانی ماوەیەك لەرۆژ شەڕ بکەن! ئەوان شیاوی هاوکاری نین چونکە خەڵکانێکی پەست و لاوازن. ئەی سەروەری باوەڕداران هاوکاریان مەکە تا خۆیان شەڕ لەگەڵ دوژمنان بکەن تا ئاشکرا ببێت چ کەسێك لەسەر فەرمان بردن لە تۆ شەڕ دەکات و کێ تەسلیمی دوژمنان دەبێت. یەزید وتی: هاوار لەتۆ! دوای ئەوان ژیان فیڕۆیە! لەگەڵ خەڵکان بۆ شەڕ بەرێکەوە.

دەستەیەك دەڵێن: معاویە بەیەزیدی وت: تۆ لەگەڵ خەڵکانی مەدینە رۆژێکی دژوارت لەبەردەمدایە، ئەگەر ئەو کارەیان کرد، موسلیم کوڕی عوقەبە بۆ شەڕی ئەوان رەوانە بکە چونکە کەسێکە لەچاکەخوازی ئەو ئاسودەم و چەندین جارم ئەوم تاقی کردۆتەوە و دەزانم باشترین بەکرێگیراوی ئێمە ئومەوییەکانە. کاتێك خەڵکانی مەدینە تەوقی فەرمانبردنی یەزیدیان فرێدا، یەزید موسلیمی بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد. ئەو لەناو خەڵکی ئاوازی کۆبونە و رۆشتن بۆ حیجازی بەرز کردەوە و وتی بەخششەکانی خۆیان هەڵگرن و جیاواز لەوە، هەر کام سەد دینار وەك هاوکاری وەربگرن. دوانزە هەزار پیاوی شەرکەر ئامادەییان نیشاندا. یەزید رۆشت و بەناویاندا گەڕا. ئەو پاڵی بەشمشێرێکەوە دا و کەوانێکی خستە سەرشان و وتی:

| | |
|---|---|
| ابلغ ابا بکر اذا الیل سری | و هبط القوم علی وادی القری |
| اجمع سکران من القوم تری | ام جمع یقظان نفی عنه الکری |
| یا عجبا من ملحد یا عجبا | مخادع بالدین یعفو بالعری |

یانی: کاتێك شەو بگات و خەڵك لە (وادی قرا) دابەزن، پەیام بەئەبوبەکر بدە کە: ئایا دەستەیەك لەسەرخۆشەکان دەبینی یا دەستەیەك لەیەقزانیەکان کە خەو لەوان دورکەوتۆتەوە؟ سەیرە لەبێ باوەڕێك سەیرە! ئەوەی دینەکەی خۆی دەکاتە گاڵتەجار و لەبیابان لەناو خاك و خۆڵی لەناوچون دەگەوزێت.

سوپاییەکان بەسەرکردایەتی موسلیم کوڕی عوقەبە بەرێکەوتن. یەزید پێی وت: ئەگەر بەلایەکت بەسەر هات، حوصەین کوڕی نەمیری سەکونی وەك جێگری خۆت دەستنیشان بکە. پێی وت: سێ رۆژ مۆڵەت بەخەڵکانی مەدینە بدە و پێشنیاری فەرمانبەریان پێ بکە، ئەگەر رازی بون چ باشتر و گەرنە شەڕیان لەگەڵ بکە و کاتێك بەسەر ئەواندا

سەرکەوتیت، بۆ ماوەی سێ رۆژی بەردەوام تالآن و کوشتاریان بکە و شەڕکەران هەرچی سامان و مەڕمالآت و کەرەستەی شەڕ بەدەست بێنن، بۆ خۆیان بێت. ئاگات لەعەلی کوڕی حسین بێت و پێشنیاری چاکە کردن لەگەڵ ئەو بکە چونکە بەم کارەی خەڵکان رازی نەبو و نامەیەکی بۆ من نوسی.

کاتێك خەڵکانی مەدینە کارگوزاری یەزیدیان لەشارەکە دەرکرد، مەروان کوڕی حەکەم لەگەڵ عەبداللە کوڕی عومەر قسەی کرد و داوای فەرمانێکی لێکرد تا ژن و منالەکانی لە مالی ئەودا بشارێتەوە. عەبداللە رازی نەبو. مەروان لەگەڵ عەلی کوڕی حسین قسەی کرد. وتی: ژن و منال لەناو مالەکەی مندا بەسەر دەبەن و شەوانە لای من دەمێننەوە، ئەمانە لەگەڵ کەسانی بنەمالەکەی تۆ دەبن. ئەو هاوسەرەکەی عایشە کچی عوسمان کوڕی عەففانی لەگەڵ منالەکانی خۆی بۆ لای عەلی کوڕی حسین رەوانە کرد. عەلی کەسەکانی خۆی و بنەمالەکەی مەروانی بۆ گوندەکەی خۆی لەیەنبەع برد. دەستەیەك دەڵێن: عەلی بنەمالەکەی خۆی بەکوڕەکەی عەبداللە کوڕی عەلی بۆ تایف رەوانە کرد و بنەمالەی مەروانی کردە هاورێی ئەوان.

کاتێك عەبدولمەلیك کوڕی مەروان بیستی یەزید سوپای بۆ مەدینە رەوانە کردوە، وتی: ئەی هاوار، خۆزگە ئاسمان دەکەوتە سەر زەوی، چ کارێکی گران و مەترسیدارە!

عەبدولمەلیك دواتر خۆی گیرۆدەی ئەزمون بویەوە و ناچاربو حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی رەوانەی مەککە بکات. حەجاج بەرێکەوت و گەمارۆی خستە سەر مەککە و کەشکەنجیری بۆ کەعبە دانا و کوڕی زوبەیر کوڕی عەوامی کوشت. بەلآم موسلیم کوڕی عوقبە، لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو مەدینە بەرێکەوت. کاتێك ئەم هەواڵە بەخەڵکانی مەدینە گەیشت، زیاتر گوشاریان خستە سەر ئومەوییەکان. ئەوان لەمالەکەی مەرواندا بون. پێیان وتن: سوێند بەخوا دەستتان لێ هەڵناگرین تا دەتانکوژین، یا پەیمان و سوێندی خوایی بەئێمە دەدەن کە زیانمان پێ ناگەیێنن و کەس لەشوێنە زیان وەرگرەکانی ئێمە ئاگادار ناکەنەوە و دوژمن هان نادەن. ئومەوییەکان سوێندیان خوارد و پەیمانیاندا و خەڵکانی مەدینە ئەوانیان لەناو خۆیان دەرکرد.

خەڵکانی مەدینە لە رێگەی شامەوە تا ئەم شارە لەهەمو کانی و ئاوخۆرەکان مەشەکەیەك لەقەتران و خەوش و خۆڵیان دانابو، بەلآم خواوەند بارانێکی ئاسمانی

دابارند و خەڵکانی شام تا گەیشتن بەمەدینە لەهیچ مەشکەیەك ئاویان نەخواردەوە.
کاتێك خەڵکانی مەدینە ئومەوییەکانیان دەرکرد، ئەوان هاورێ لەگەڵ باروبنەی خۆیان بەرێکەوتن تا لەوادی قورا چاویان بەموسلیم کوڕی عوقبە کەوت. ئەو پێش کەسانیتر عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەففانی بانگ کرد و پێی وت: لەباروداۆخی مەدینە ئاگادارم بکەرەوە و رێگەی راستم نیشان بدە. عەمرۆ وتی: ناتوانم چونکە خەڵکانی مەدینە سوێند وپەیمانیان لەئێمە وەرگرتوە کە کەس لەشوێنە زیان وەرگرەکانی ئەوان ئاگادار نەکەینەوە و هاوکاری دوژمنەکانیان نەکەین. موسلیم کوڕی عوقبە بەتوندی قسەی لەگەڵ کرد و وتی: ئەگەر کوڕی عوسمان نەدەبویت، دەمکوشتی. سوێند بەخواوەندی خوا، لەم بێدەنگیە دوای تۆ لەهیچ قوڕەیشیەك رازی نابم. عەمرۆ ڕۆشت و هاوەڵانی خۆی ئاگادار کردەوە. مەوران کوڕی حەکەم بەکوڕەکەی خۆی عەبدولمەلیك کوڕی مەورانی وت: پێش من بڕۆی لای ئەگەری هەیە لەمن بەتۆ بەسەندە بکات. عەبدولمەلیك ڕۆشت و موسلیم پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟ باسی بکە. عەبدولمەلیك وەڵامی دایەوە: ئەو کارە دەکەم. بۆچونی من وایە سوپاکەی خۆت ببەیت و کاتێك گەیشتیتە دارخورماکان، خەڵك لەسێبەری دارخورماکان دابەزێنێت تاشیرەی خورما بخۆن. کاتێك بەیانی دەگات، بەرێکەویت و مەدینە لەلای چەپی خۆتەوە بەجێبێڵیت و دواتر بەدەوریدا بسورێیتەوە تا لەرۆژهەڵات لەحورەوە بڕۆیتەسەر خەڵکانی مەدینە و روبەرویان ببیتەوە. کاتێك لەگەڵ ئەوان روبەرو دەبیتەوە کەخۆر لەسەر ئەوان هەڵآتبێت و هەتاو لەپشتەوە لەسوپاکەی تۆ بدات و زیانیان لێ نەدات بەڵکو زیان لەخەڵکانی مەدینە دەدات. ئەوان لەدرەخشانەوە خودەکان، ڕمەکان، تیرەکان، شتێك دەبینن کە ئێوە نایبینن و ئەم کارە تا هەر کاتێك کە ئێوە لەرۆژئاوایی ئەواندا بن، بەردەوام دەبێت. دواتر شەڕیان لەگەڵ بکە و داوای هاوکاری لەخوا بکە.

موسلیم پێی وت: دەست خۆش بۆ باوکت کەچ پیاوێکی نازەنینی گەورە کردوە!
دواتر مەروان ڕۆشتە لای. وتی: ها! مەروان وتی: مەگەر عەبدولمەلیك نەهاتە لای تۆ؟ وتی: هات، چەن فرەزانە عەبدولمەلیك! هیچ پیاوێکی قوڕەیشیم نەبینی هاوتای ئەو بێت. مەروان وتی: ئەگەر چاوت بەعەبدولمەلیك کەوتبێت، چاوت بەمن کەوتوە. دواتر موسلیم بەرێکەوت و گەیشتە هەر شوێنێك، ئەو کارەی ئەنجامدا کە عەبدولمەلیك پێی

وتبو. لەرۆژهەڵاتەوە هێرشی کردە سەر ئەوان. دواتر موسلیم ئەوانی بانگ کرد و وتی: سەروەری باوەڕداران گومان دەکات ئێوە بناغەی ئەم کارەن و ئیسلام لەسەر دەستی ئێوە هەڵدەسورێت و من کوشتنی ئێوە بەناخۆش دەزانم و سێ رۆژ مۆڵەتتان پێدەدەم. هەر کەس لەرێگەی چەوتی و خواری بگەرێتەوە سەر رێگەی راست، لێی خۆش دەبم. دواتر من لەشارەکەی ئێوە دەڕۆم و هێرش دەکەمە سەر ئەو پیاوە پەیمان شکێنە کە لەمەککە قوت بۆتەوە. ئەگەر رازی نەبن، ئاگاداری پێویستم بەئێوەداوە.

کاتێك سێ رۆژ تێپەری کرد، وتی: ئەی خەڵکانی مەدینە، چی دەکەن؟ ئاشتی یا شەڕ هەڵدەبژێرن؟ وتیان: شەڕ دەکەین. وتی: شەر مەکەن و تەسلیمی فەرمانەکان بن و ئێمە هەوڵی خۆمان بۆ لەناو بردنی ئەو بێ دینە دەخەینەگەڕ کە بێ باوەڕان و خراپەکارانی لەهەر لایەکەوە لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە. مەبەستی کوڕی زوبەیر بو. خەڵکانی مەدینە وتیان: ئەی دوژمنانی خوا! ئەگەر بتانەوێت هێرش بکەنە سەر ئەو، دەست بەرداری ئێوە نابین. رێگەتان پێ بدەین بەرەو بارەگای خوایی برۆن و خەڵکەکەی بترسێنن و لەوێ خراپەکاری بکەنە پیشە و رێزی خەڵکەکەی پێشێل بکەن، سوێند بەخوا، رێگەی ئەو کارەتان پێ نادەین.

خەڵکانی مەدینە شوێنێکیان دەست نیشان کردبو و چەندین پیاو پاسەوانیان لێ دەکرد. فەرماندەیی ئەوان لەدەستی عەبدولرەحمان کوڕی زوبەیر کوڕی عەوف کوڕی مامی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بو. فەرماندەکانیتر ئەم کەسانە بون: عەبداللە کوڕی موتیع، لەسەر بەشێك و گەرەکێك لەو قورەیشانەی لەمەدینە ژیانیان بەسەر دەبرد و مەعقەل کوڕی سینانی ئەشجەعی لەهاوەڵانی پێغەمبەر بەسەر بەشەکەیتر کە لەموهاجیرەکان پێك دەهاتن. سەرکردەی هەمویان عەبداللە کوڕی حەنزەلەی ئەنساری فەرماندەی گەورەترین بەش یا دەستە بو کە ئەنساری لەخۆ دەگرت.

موسلیم لەگەڵ هاورێیانی خۆی شەڕی دەست پێکرد. لەلای حوڕەوە هێرشی کردە سەر ئەوان و خێوەتەکەی خۆی لەسەری رێگەی کوفە هەڵدا. ئەو نەخۆش بو. فەرمانیدا و کورسیان بۆ هێنا و لەناو دوریزدا خستیانە سەر زەوی. وتی: ئەی خەڵکانی شام، لەلایەن فەرماندەکەی خۆتانەوە شەڕ بکەن و لەخوا بپارێنەوە. ئەوان روبەروی هیچ کام لە بەش و دەستەکانی مەدینە نەبونەوە مەگەر ئەوەی تێکیان شکاندن. دواتر سوارەکانی بۆ

روبەرو بونەوە لەگەڵ کوڕی حەنزەلە رەوانە کرد. کوڕی حەنزەلە لەگەڵ هاورێکانی خۆی هێرشی کردە سەر ئەوان و پاشەکشێی پێکردن تا گەیشتنە لای موسلیم. ئەو لەگەڵ پیاوەکانی خۆی هەستایە سەرپێ و هاواری کرد و شەڕێکی ئازایانەی دەست پێکرد.

دواتر فەزل کوڕی عەباس کوڕی رەبیعە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب هاتە لای کوڕی حەنزەلە و هاورێ لەگەڵ بیست سوار ئازایانە شان بەشانی ئەو شەڕی کرد. دواتر کوڕی حەنزەلە پێی وت: هەر سوارەیەك کە لەگەڵ تۆیە، بابێتە لای من و لای من بوەستێت. کاتێك من هێرش دەبەم، ئەوانیش هێرش بەرن. سوێند بەخوا دەست لەشەڕ هەڵناگرم تا دەستم بەموسلیم دەگات و دەیکوژم. ئەم کارەی کرد و سوارەکانی لەدەوری ئەو کۆکردەوە. فەزل بەهاوکاری ئەوان هێرشی کردە سەر شامیەکان و بڵاوەیان لێکرد. بەهاوەڵانی خۆی وت: گیانم قوربانی ئێوە بێت، هێرشێکی نوێ دەست پێ بکەن چونکە سوێند بەخوا ئەگەر دەستم بەسەرکردەکەیان بگات، دەیکوژم یا گیانم لەم رێگادا دەبەخشم. دواهاتی خۆڕاگری تەنیا سەرکەوتنە. سوارەکان لەدەوری موسلیم کوڕی عوقبە بڵاوەیان لێکرد و ئەو لەگەڵ پێنسەد پیادە مانەوە و کەوتنە سەر ئەژنۆ و رمەکانیان روبەروی خەڵکانی مەدینە بەرز کردبویەوە. فەزل بەردەوام پێشڕەوی دەکرد تا گەیشتە ئاڵاکەی موسلیم و سەری ئاڵاهەڵگرەکەی ئەوی پەڕاند. پێی وت: بیگرە کە من کوڕی عەبدولموتەلیبم! گومانی دەکرد موسلیمە. وتی: سەرکردەی ئەوانم کوشت. موسلیم وتی: قونت لەسەر کونەکە نەبو.

ئەو کەسەی لەسەر دەستی فەزل کوڕی عەباس کوژرا، کۆیلەیەکی رۆمی زۆر بوێر بو. موسلیم ئاڵاکەی هەڵگرت و هانی خەڵکانی شامیدا و وتی: هاورێ لەگەڵ ئەم ئاڵایە هێرش بەرن. لەگەڵ ئاڵاکەی پێشڕەوی دەست پێکرد و خەڵکان لەپێش ئاڵاکەوە هێرشیان کرد. فەزل کوڕی عەباس کاتێك کوژرا کە دوری ئەو لەخێوەتەکەی موسلیم کوڕی عوقبە تەنیا دەگەز بو. زەید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف هاورێ لەگەڵ ئەو کوژرا.

سوارەکان و پیادەکانی موسلیم رویان لەکوڕی حەنزەلە کرد. ئەو هاورێکانی خۆی هاندەدا و سەرکۆنەی خەڵکانی مەدینەی دەکرد و سوارەکانی بۆ روبەروبونەوەی کوڕی

حەنزەلە رەوانە دەكرد. نەیانتوانی پێشرەوی بكەن لەبەر ئەوەی رم و شمشێرەكان لەبەرابەر ئەوان بەرز كرابونەوە. بەردەوام بلاّو دەبونەوە. موسلیم حوصەین كوڕی نەمیر و عەبدالله كوڕی عزای ئەشعەری بانگ كرد و فەرمانی پێدان لەگەلّ سوپاكەی خۆیان دابەزن. ئەم دوانە هاتن و پێشرەویان دەست پێكرد. كوڕی حەنزەلە بەهاوەلاّنی خۆی وت: دوژمنی ئێوە لەهەمان جێگە و بەو شێوەی كەدەبێت، شەریان دەست پێكردوە، گومانم دەكرد كاتژمێرێك زیاتر چاوەڕێ نەكەن تا خوا لەنێوان ئێوە و ئەوان داوەری بكات و شەرِ لەبەرژەوەندی یا زیانی ئێوە كۆتایی پێ بێنێت. ئێوە هاوەلاّنی پێغەمبەر و خەلّكانی مەدینەن، گومانم نیە كە خوا لەخەلّكی هیچ ناوچەیەك بەئەندازەی ئێوە رازی و رەزامەند بێت و لەخەلّكانی هیچ سەرزەمینێك بەئەندازەی خەلّكانی شام تورە بێت. ئەوان لەگەلّ كەسانێكی هاوشێوەی ئێوە شەرِ ئەزمون دەكەن. بەلّێ، چارەنوسی هەر كام لەئێوە مەرگە و بەناچار دەبێت كۆچ بكەن بەلاّم سوێند بەخوا هیچ مەرگێك لەپێشتر لەمەرگی كوژراوان لەرێگەی خوادا نیە. خوا ئەم مەرگەی پێ بەخشیوەن، كەواتە رێزی لێ بگرن.

دواتر ئەمان لەیەك نزیك كەوتنەوە. خەلّكانی شام تیربارانیان كردن. كوڕی حەنزەلە هاواری كرد: بۆ خۆتان دەكەن بەنیشانەی تیری خەلّكانی شام! هەر كەس دەیەوێت بەخێرایی بەرەو بەهەشت بڕوات لەدەوری ئەم ئالآیە كۆببێتەوە. ئەوانەی بەدوای مەرگدا دەگەڕان لەدەوری ئەو كۆبونەوە و شەرێكی قورسیان دەست پێكرد. تا ئەو رۆژە شەرێكی لەو چەشنە نەبینراوە. كوڕی حەنزەلە كوڕەكانی خۆی یەك یەك بۆ پێشەوە رەوانە كرد تا هەمویان كوژران. ئەو بەشمشێرەكەی خۆی شەرِی دەكرد ودەیوت:

بعدا لمن رام الفساد و طغی          و جانب الحق و ایات الهدی

لا یبعد الرحمن الا من عصی

یانی: دور بێت ئەو كەسەی مەبەستی خراپە دەكات و یاخیگەری دەكاتە پیشە. و لەراستی و دروستی خۆی بەدور دەگرێت و نیشانەكانی رزگاری پشت گوێ دەخات. خوای مێهرەبان تەنیا گوناحكاران لەدەرگاكەی خۆی دور دەكاتەوە.

ئەو كوژرا و هاورێ لەگەلّ ئەو براكەی لەدایكەوە یانی محەممەد كوڕی سابت كوڕی قەیس كوڕی شەماس. وتی: حەزم نەدەكرد تەنانەت دەیلەمیەكان لەجیاتی ئەم خەلّكە

منیان دەكوشت. عەبداللە كوڕی زەید كوڕی عاسم و محەممەد كوڕی عەمرۆ كوڕی حەزمی ئەنساری لەگەڵ ئەو كوژران. مەروان لای ئەو تێپەڕی كرد و وتی: خوا لێت خۆش بێت، زۆر شەو تۆم بینی كەنوێژت تا بەرەبەیان درێژ دەكردەوە. خەڵك شكەستیان خوارد. یەكێك لەوان محەممەد كوڕی سەعد كوڕی ئەبی وەقاس بو كەئازایانە شەڕی دەكرد.

موسلم كوڕی عوقەبە سێ ڕۆژ مەدینەی بۆ سوپاكەی خۆی ئازاد و ڕەوا كرد كە لەو ماوەدا خەڵكیان كوشت و سامانەكانیان تاڵان كرد و كاڵاكانیان دەدزی. كەسانێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر كە لەم شارەدا بون، ترسان. ئەبوسەعیدی خدری بۆ ئەشكەوتێك پەنای برد. پیاوێك لەخەڵكانی شام شوێنی كەوت و نەگەڕایەوە. ئەو بەدوای ئەبو سەعید ڕۆشتە ناو ئەشكەوتەكە. ئەبوسەعید شمشێرەكەی خۆی بەرز كردەوە تا ئەو پیاوە بترسێنێت. شامی دەستی هەڵنەگرت. ئەبوسەعید شمشێرەكەی كردە كاڵان و وتی: ئەگەر تۆ دەست درێژی دەكەیتە سەرمن بۆ ئەوەی بمكوژیت، من ئەو كارە ناكەم تا تۆ بكوژم (مایدە/٢٨/٥). پیاوەكە پرسی: كێیت؟ وتی: ئەبوسەعیدی خدری. وتی: هاوەڵی پێغەمبەری خوا؟ وتی: بەڵێ. پیاوەكە دەستی لێهەڵگرت و بەرێگەی خۆیدا ڕۆشت.

دەڵێن: كاتێك موسلیم كوڕی عوقەبە لەنزیك مەدینە دابەزی، خەڵكانی مەدینە لەناو دەستە فراوانەكان و بەرێكخستنێكی بەشكۆ هێرشیان كردنە سەر. خەڵكانی شام ترسیان لێ نیشت و جیاواز لەوە، نەیاندەویست لەگەڵ خەڵكانی شوێنی مانەوەی پێغەمبەر شەڕ بكەن. كاتێك موسلیم ئەوانی بینی، سەركۆنەی كردن و جوێنی پێدان و بۆ شەڕ هانیدان. دواتر شەڕیان دەست پێكرد.

لەگەرماوگەرمی شەڕەكە، لەناكاو خەڵك دەنگی تەكبیریان لەپشتی سەریانەوە لەناو مەدینە بیست. هۆكارەكەی ئەوە بو كە بەنی حارسە، خەڵكانی شامیان بردە ناو شارەكە و خەڵك شكستیان خوارد و هەڵاتن.

موسلیم كوڕی عوقەبە فەرمانی بەخەڵكدا لەگەڵ یەزید بەیعەت بكەن لەسەر ئەو بنەمای كەكۆیلەی ئەون و بەهەر شێوەیەك كەبیەوێت، دەتوانێت فەرمانڕەوایی بەسەر خوێن و سامان و كەسانی بنەماڵەی ئەوانەوە بكات. هەركەسێك بەمشێوەیە بەیعەتی نەدەكرد، دەیكوشت. داوای ئەمان بۆ ئەم كەسانە كرا: یەزید كوڕی عەبداللە كوڕی

رەبیعە کوڕی ئەسوەد، محەممەد کوڕی ئەبی جوهم کوڕی حوزەیفە و مەعقەل کوڕی سینانی ئەشجەعی. یەك ڕۆژ دوای کۆتایی هاتنی شەڕ ئەوانیان هێنا. وتی: لەسەر ئەو بنەمایە بەیعەت بکەن.

دو قورەیشی وتیان: لەگەڵ تۆ لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر بەیعەت دەکەین. ئەو هەردوکیانی کوشت. مەروان وتی: پەنا بەرخوا، دوپیاو لەقورەیش دەکوژیت کە ئەمانیان پێ بەخشراوە. ئەو داردەستەکەی خۆی کێشا بەرانی مەرواندا و وتی: تۆیش ئەگەر ئەو قسەت دەهێنایە سەرزمان، دەکوژرایت.

مەعقەل کوڕی سینان هات و لەگەڵ خەڵك دانیشت. داوای خواردنەوەیەکی کرد تا بیخواتەوە. موسلیم پێی وت: چ شتێك زیاتر پەسەند دەکەیت بۆ خواردنەوە؟ وتی: هەنگوین یا ئاو. وتی: دەرخواردی بدەن. خواردی تا ئەوەی شادمان بو. پێی وت: ئایا تێراو بویت؟ وتی: بەڵێ. وتی: سوێند بەخوا ئیتر هیچ خواردنەوەیەك ناخۆیت مەگەر لەئاگری دۆزەخ. مەعقەل هاواری کرد: سوێندت دەدەم بەخوایەتی خوا و خزمایەتی تا نەمکوژیت! موسلیم وتی: تۆ ئەو کەسەیت دوای چاوپێکەوتن لەگەڵ یەزید، لەشەودا لەتەبەریە چاوت بەمن کەوت و وتت: یەك مانگ ڕێگەمان بڕی، بەیەك مانگیش دەگەڕێینەوەی لای پیاوێکی خراپەکار، بەدەستی خاڵی بۆ مەدینە دەگەڕێینەوە و ئەم خراپەکاری خراپەکار زادە لەسەر کار لادەبەین و لەگەڵ پیاوێك لەموهاجیرەکان بەیعەت دەبەستین یا کاروبارەکان بەئەنسار دەسپێرین. ئێستا خەڵکانی غەتەفان و ئەشجەع لەکوێن و خەلافەت لەکوێیە؟ من سوێندم خواردوە لەهەر شوێنێك و لەهەر شەڕێك دەستم بەتۆ بگات، بتکوژم. دواتر فەرمانیدا و ئەویان کوشت.

یەزید کوڕی وەهبیان هێنا و موسلیم پێی وت: بەیعەت بکە. وتی: لەسەر بنەمای نوسراوی خوا و شێوازی پێغەمبەر بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکەم! وتی: سوێند بەخوا ڕازی نابم. لەم کاتەدا مەروان لەسەر بنەمای پەیوەندی نێوان خۆی و یەزید قسەی کرد. موسلیم فەرمانیدا و مشیتان لەدەمی مەرواندا و دواتر یەزیدیان کوشت.

دواتر عەلی کوڕی حسینیان هێنا. ئەو لەلای مەروان و کوڕەکەی عەبدولمەلیك تێپەڕی و لای موسلیم دانیشت. مەروان کوڕی حەکەم داوای خواردنەوەیەکی کرد تا بەخواردنەوەی لەزیانی موسلیم ڕزگاری بێت و ڕێزی لێ بگیرێت. کەمێکی خواردەوە و دواتر دای

بەعەلی کوڕی حسین. کاتێك خواردنەوەکە بەدەستی گەیشت، موسلیم وت: لەخواردنەوەی ئێمە مەخۆرەوە! دەستی لەرزی، ئەو لەگیانی خۆی دەترسا و قاپەکەی گرت. بەموسلیمی وت: لەناو ئەم دوکەسەوە هاتیت تا لای من ئەمانت پێ ببەخشرێت؟ سوێند بەخوا ئەگەر کارەکان لەدەست ئەم دوانەدا بوایە، تۆم دەکوشت! بەلام سەروەری باوەڕداران رایسپاردوم چاکە لەگەڵ تۆ بکەم و وتی کە نامەت بۆ نوسیوە. ئەگەر دەتەوێت خواردنەوەکەت دەخۆمەوە. ئەو خواردیەوە و دواتر موسلیم ئەوی لای تەختەکەی خۆی دانیشاند و وتی: ئەگەری هەیە بنەماڵەکەت ترسابێتن؟ وتی: بەڵێ. فەرمانیدا چوارپێیەکان هێنا و زین و لغاویان کرد وسواریان کرد و بۆ لای بنەماڵەکەی رەوانەیان کرد. ئەوی بۆ بەیعەت هاوشێوەی بەیعەتی خەڵکانی مەدینە، ناچار نەکرد.

عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباسیان هێنا تا بەیعەت بکات. حوصەین کوڕی ئەمیر وتی: خوشکەزاکەی ئێمە تەنیا هاوشێوەی عەلی کوڕی حسین بەیعەت دەکات. دایکی عەلی کوڕی عەبدالله لەخەڵکی کێندە بو. کێندیەکان پشتیوانیان لەحوصەین کرد. موسلیم کوڕی عوقەبە وازی لێهێنا. عەلی وتی:

ابی العباس قرم بنی قصی ... و اخوالی الملوك بنو و ليعة

هم منعوا ذماری یوم جائت ... کتائب مسرف و بنو اللکیعه

ارادونی التی لا عز فیها ... فحالت دونه اید سریعه

یانی: عەباس ئەو گەورە°پیاوە شێرە لەبەنی قوسەی و هەروەها خاڵە شەهریارەکانی من لەبەنی وەلیعە، لەرازی بون بەستەم خۆیان بەدور گرت. ئەوان پارێزگاریان لەمن کرد و ئەمە لەکاتێکدا بو دەستە شەڕکەرەکانی پیاوی خوێنخۆر و زادەکانی کەنیزی پەست گەیشتن. داوای کارێکیان لێکردم هیچ رێز و شکۆیەکی تیا نەدەبینرا. بەلام دەستانێکی چوست و چالاك لەم کارە وێگریان کرد.

مەبەستی لەپیاوی خوێنخۆر موسلیم کوڕی عوقەبە بو کە دوای روداوی حورە بەو ناوە بانگ کرا. بەنی وەلیعە تیرەیەك لەکێندە کە دایکی لەخەڵکانی ئەوێ بو. لکیعە دایکی دایکی ئەو بو.

دەڵێن: عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەفان هاورێ لەگەڵ نومەوییەکان لەشارەکە نەرۆشتەدەر. لەو رۆژەدا ئەویان بردە لای موسلیم. وتی: ئەی خەڵکانی شام، ئایا ئەم

پیاوە دەناسن؟ وتیان: نە. وتی: ئەمە ناپاکی لەپاك بوە. ئەمە عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەففانە. ئێستا ئەی عەمرۆ، مەبەستی ئەوەت کرد ئەگەر خەڵکانی مەدینە سەرکەون، بڵێیت: من یەکێکم لەئێوە و ئەگەر خەڵکانی شام سەرکەون، بڵێی: من کوڕی سەروەری باوەڕداران عوسمانم. فەرمانیدا و موی ریشی ئەویان هەڵکەند. دواتر وتی: ئەی خەڵکانی شام، دایکی ئەم پیاوە، تەپاڵەی دەکردە دەمی خۆی و دواتر دەیوت، ئەی سەروەری باوەڕداران، لەسەر ئەوەی لەناو دەممدایە، گرێو لەگەڵ تۆ دەکەم. لەدەمیدا شتێك کەدەیویست. ئەو ژنە لەخەڵکانی دوس بو.

دواتر موسلیم وازی لێهێنا.

## پاشماوەی روداوەکان

شەڕی حوڕە دو شەو بۆ کۆتایی زی حەجەجەی ساڵی شەست و سێ / ٢٨ ئوتی ٦٨٣ رویدا.

محەممەد کوڕی عومارە دەڵێت: بۆ بازرگانی ڕوم کردە شام. رۆژێك پیاوێك لەمنی پرسی: خەڵکی کوێیت؟ وتم: مەدینە. وتی: شارێکی گڵاو و ناپاکە. وتم: پێغەمبەری خوا بەپاکی ناو دەبرد و تۆ دەڵێی ناپاکە. وتی: من لەگەڵ ئەم شارەدا بەسەرهاتێکم هەیە: کاتێك خەڵکان بۆ شەڕی حوڕە ڕۆیشتن، لەخەودا بینیم پیاوێکم بەناوی محەممەد کوشت. لەخەودا وتیان بەکوشتنی ئەو دەکەویتە جەهەننەم. هەوڵمدا لەگەڵ سوپاکە بۆ مەدینە نەڕۆم بەڵام هەوڵەکەم بێ ئەنجام بو. لەگەڵ ئەوان ڕۆشتم بەڵام شەڕم نەکرد تا شەڕ کۆتایی هات. لەناو کوژراوەکاندا گەڕام وپیاوێکم بینی کەهێشتا نیوە گیان بو. وتی: دور کەوەرەوە ئەی سەگ! من لەجوێنەکەی توڕە بوم و کوشتم. دواتر خەوەکەی خۆم بیرکەوتەوە و ڕۆشتم پیاوێکی خەڵکی مەدینەم هێنا تا بەسەر کوژراوەکاندا بگەڕێت و کاتێك گەشتە سەر ئەوپیاوەی بەدەستی من کوژرا، وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە ٢/ ١٥٦) بکوژی ئەم پیاوە ناچێتە بەهەشت. وتم: کێیە؟ وتی: محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم، لەرۆژگاری پێغەمبەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا و پێغەمبەر ناوی نا محەممەد و نازناوی باوکی عەبدولمەلیکی پێ بەخشی. من ڕۆشتمە لای بنەماڵەی کوژراو تا تۆڵەی خۆیان وەربگرن و بمکوژن بەڵام نەیانکوشتم. پێشنیاری خوێنبایيم پێکردن بەڵام رازی نەبون.

لەناو کوژراوەکانی حوڕە ئەم کەسانە دەبینران: عەبدالله کوڕی عاسمی ئەنساری،

عەبدالله کوڕی وەهب کوڕی مەوهەب، وەهب کوڕی عەبدالله کوڕی زەمعە کوڕی ئەسوەد، عەبدالله کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حاتب، زوبەیر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و عەبدالله کوڕی نەوفل کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا رەبیع کوڕی خەسیمی کوفی خۆپارێز (ناسراو بەناوی خاجە (خواجە) رەبیع لەتوس) مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر حەجی لەگەڵ خەڵ کرد. ئەویان بەپەنادەر ناو دەبرد و کاروبارەکانی خەڵکیان بەراوێژی گشتی رێك دەخست. لەرۆژی یەکی موحەرەم /٣٠ ئوتی ٦٨٣ زایینی، سەعید کۆیلەی میسوەر کوڕی مەخرەمە هەواڵی شەڕی حوڕەی پێراگەیاند. ئەم هەواڵە لای ئەو گران بو. خۆی و هاوەڵانی بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد چونکە دەیانزانی موسلیم کوڕی عوقبە هێرش دەکاتە سەریان.

## رووداوەکانی ساڵی شەست و چواری کۆچی( ٦٨٢ - ٦٨٤ زایینی )

### رەوانە بونی موسلیم کوڕی عوقبە بۆ گەمارۆ خستنە سەر کوڕی زوبەیرمردنی موسلیم

کاتێك موسلیم کوڕی عوقبە لەکوشتار و تالآن کردنی خەڵکانی مەدینە تەواو بو، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی روی لەمەککە کرج تا عەبداللە کوڕی زوبەیر و هاوەڵانی سەرکوت بکات. ئەو رەوەح کوڕی زەنباعی جوزامی یا عەمر کوڕی مەخرەمەی ئەشجەعی وەك جێنشینی خۆی لەمەدینە دەست نیشان کرد. کاتێك گەیشتە (موشەللەل) وادەی مەرگی گەیشت. دەستەیەك دەڵێن: لەتەپۆڵکەی هەرشی گیانی سپارد. کاتێك وادەی مردنی گەیشت، حوصەین کوڕی نەمیری بانگ کرد و پێی وت: ئەی کوڕی بەرزوعەی کەر! ئەگەر کاروبارەکان لەدەست من دەبو، تۆم نەدەکردە فەرماندەی ئەم سوپایە بەڵام سەروەری باوەڕداران تۆی دەست نیشان کردوە. ئەم چوار ئامۆژگاریەیی من لەگوێ بگرە: بەخێرایی بەرێکەوە، لەشەڕ کردن پەلە بکە، هەمو هەواڵەکان کۆبکەرەوە و هیچ کام لەقورەیشیەکان مەکەرە رازداری خۆت. دواتر وتی: ئەی خوایە، دوای وتنی (هیچ خوایەك جگە لەخوا نیە) و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە) هیچ کارێکم نەکرد لای من خۆشەویستر و هیوابەخشتر بۆ ئەو جیهانەم بێت مەگەر کوشتاری خەڵکی مەدینە.

کاتێك موسلیم مرد، حوصەین لەگەڵ خەڵك بەرێکەوت و چوار رۆژ بۆ کۆتایی موحەرەم ساڵی ٦٤/ ٢٤ سێپتامبەری ٦٨٣ زایینی رۆشتە مەککە. خەڵکی ئەم شارە و خەڵکانی حیجاز لەگەڵ عەبداللە کوڕی زوبەیر بەیعەتیان کردبو. هەڵاتوانی بزوتنەوەکەی مەدینەیش پەیوەستی ببون. نەجدە کوڕی عامری حەنەفی لەگەڵ خەواریجی شوێنکەوتەی خۆی پەیوەستی بو. ئەوان پارێزگاریان لەماڵی خوا کرد.

کوڕی زوبەیر بۆ روبەروبونەوە لەگەڵ خەڵکانی شام هاتەدەر و براکەی مونزەر کوڕی زوبەیر هاورێیەتی دەکرد. مونزەر لەگەڵ پیاوێك لەخەڵکانی شام شەڕی دەستەویەخەی کرد. هەرکام زەربەیەکیان لەویتردا بەشێوەیەك کە هەردوکیان کوژران. دواتر خەڵکانی شام بەشێوەیەکی گشتی و لەناکاو هێرشیان کردە سەریان و ریزەکانی سوپاکەی عەبداللەیان تێکشکاند. ئێسترەکەی عەبداللە کەوتە سەر زەوی، تۆپی. دابەزی و هاوەڵانی خۆی بانگ کرد. میسوەر کوڕی مەخرەمە و موصعەب کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی

عەوف هاوکاریان کرد و ئەوەندە شەڕیان کرد تا هەردوکیان کوژران. کوڕی زوبەیر تا کاتی شەو شەڕی لەگەڵ کردن و دواتر دەستیان لەشەڕ کردن هەڵگرت.
ئەمە یەکەمجار بو گەمارۆیان دەخستە سەر. ئەوان مانەوە و پاشماوەکانی موحەرەم و سەراسەری مانگی سەفەر/ سێپتامبەر – ئۆکتۆبەری ٦٨٣ زایینی گەمارۆیان لەسەر دانابو و شەڕیان لەگەڵ دەکرد. کاتێك سێ رۆژ لەرەبیع الاولی ساڵی ٦٤/ ٣٠ ئۆکتۆبەری ٦٨٣ زایینی تێپەڕی، ماڵی خوایان بەبەردهاوێژ وێران کرد وگڕیان تێبەردا و سرودی شەڕیان دەخوێند و وتیان:

خطارة مثل الفنيق المزبد نرمى بها اعواد هذالمسجد

یانی: کەشکەنجیرێك هاوشێوەی سەمەندێکی یاخی (یا دەریایەکی خرۆشان)مان هەیە کە دارەکانی ئەم مزگەوتی پێ دەسوتێنین.
دەڵێن: ماڵی کەعبە بەهۆی ئەو ئاگرەوە سوتا کە هاوەڵانی عەبداللە لەنزیکی ئەودا کردبویانەوە. ئەم ئاگرە بڵێسەی سەند و بۆ ئاسمان بەرز بویەوە و دواتر بەسەر ماڵەکەدا داباری و پۆششی کەعبەی سوتاند و دارەکانی کردە خۆڵەمێش. وتاری یەکەم راستترە چونکە بوخاری لە(صحیح)ی خۆیدا ئاماژەی بەوەداوە کە کوڕی زوبەیر رێگەیدا کەعبە بسوتێت و خەڵك ببینن و دژی شامیەکان راپەڕن.
شامیەکان بەهەمان شێوە گەمارۆیان لەسەر کوڕی زوبەیر دانابو تا لەسەرەتایی رەبیع الثانی / ٢٧ نۆڤەمبەری ٦٨٣ زایینی هەواڵی مەرگی یەزیدیان پێگەیشت.

## مەرگی یەزید کوڕی معاویە

لەم ساڵەدا لەچواردەی رەبیع الاول/ ١٠ نۆڤەمبەری ٦٨٣ زایینی یەزید کوڕی معاویە لەحەوارین لەسەرزەمینی شام لەتەمەنی سی و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. ئەمە گێرانەوەی دەستەیەك لەمێژوونوسانە. یەکێتر وتویەتی تەمەنی ٣٩ ساڵان بو. ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو سێ ساڵ و شەش مانگ یا هەشت مانگە. دەستەیەك دەڵێن: لەمانگی رەبیع الاولی ٦٣ / نۆڤەمبەر- دیسامبەری ٦٨٢ مرد و ساڵەکانی تەمەنی کەمتر لەسی و پێنج بو و ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی دو ساڵ و هەشت مانگ. وتاری یەکەم راستترە.
منالەکانی ئەمانە بون: ١. ئەبو عەبدولرەحمان یا ئەبو لەیلی معاویە کوڕی یەزید کە دوای ئەو هاتە سەر کار ٢- ئەبوهاشم خالید کە دەڵێن: دەستی بەکیمیا گەیشت بەڵام

راست نیە چونکە کەس دەستی پێی ناگات. ٣ ئەبو سوفیان. دایکی ئەم سیانە دایکی هاشم کچی ئەبو هاشم کوڕی عوتبە کوڕی رەبیعە بو کە دوای یەزید، مەروان کوڕی حەکەم ئەوی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. ٤- عەبدالله کوڕی یەزید کە تیرهاوێژترین پیاوی عەرەبەکان بو، دایکی ام کلسوم کچی عەبدالله کوڕی عامرە٥- عەبدالله بچوك٦- عەمرۆ٧- ئەبوبەکر ٨- عوتبە ٩- حەرب ١٠- عەبدرەحمان ١١ محەممەد لەدایکە جیاوازەکان.

دایکی یەزید، مەیسون کچی بەحدل کوڕی ئونیفی کەلبی بو.

## شێوەی کردار و گێرانەوەی کارەکانی یەزید

محەممەد کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەمرۆ عوتبی دەڵێت: رۆژێك معاویە لەگەڵ هاوسەرەکەی فورمزە دانیشتبو. ئەم دوانە سەیری یەزیدیان دەکرد کە دایکی دەستی گرتبو تا رێگە رۆشتنی فێر بکات. کاتێك دایکی یەزید لەم کارە تەواو بو، ماچی کرد. فورمزە وتی: نفرینی خوا لەپێ رەشی دایکت! معاویە وتی: سوێند بەخوا کاتێك شەرواڵەکەیم داکەند، ئەوەی لەنێوان رانەکانی دەرکەوت، باشتر لەوە بو کە لەنێوان رانەکانی تۆ دەرکەوت! لەهاوسەرەکەیتری فورمزە کوڕێکی بو بەناوی عەبدالله  کە گێژ و نەزان دەهاتە بەرچاو. دایکی فورمزە پێی وت: سوێند بەخوا ئەو گێژ نیە بەڵکو یەزید پێش ئەو دەخەیت. معاویە پێی وت: ئەمە بۆ تۆ رون دەکەمەوە. فەرمانیدا کە عەبداللەیان هێنایە لای، کاتێك هات، وتی: کوڕی ویستم، ئەوەی شیاوی بۆی، بۆت بکەم. هەر شتێکت بوێت، بۆت دەکەم. عەبدالله وتی: تکات لێ دەکەم سەگێکی تێژپێ یا کەرێکی تێژپێم بۆ بکرە. معاویە وتی: کوڕم، تۆ کەریت، کەرت بۆ بکرم، هەستە برۆ دەر. دواتر یەزیدی بانگ کرد و وتارێکی هاوشێوەی عەبداللەی پێ وت. یەزید زەوی ماچ کرد و سەری بەرز کردەوە و وتی: سوپاس بۆ خوا کە تەمەنی سەروەری باوەڕدارانی تا ئێستا درێژ کردۆتەوە و منی لەپێش چاوی ئەودا بەرێز کردوە. نیازەکانم ئەمانەن: من لەئاگری جەهەننەم بپارێزە، دوای خۆت فەرمانڕەوایی بەمن بسپێرە، ئەمساڵ شەڕی هاوین بەمن بسپێرە، کاتێك گەڕامەوە بۆ حەج کردن لەگەڵ خەڵك دەستنیشانم بکە، بەخششی خەڵکان زیاد بکە، بۆ هەر کەسێك بەئەندازەی دە دینار، بۆ بێ باوکانی بەنی جومەح و بەنی سەهم و بەنی عودەی کە هاوپەیمانی منن، بەخششێکی فراوان دیاری

بکە. معاویە ماچی کرد و وتی: رازیم. دواتر بەقورمزەی وت: ئەوت چۆن بینی؟ قورمزە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران بیکەرە جێگری خۆت.

عەمرۆ کوڕی سوبەینە دەڵێت: یەزید لەکاتی ژیانی باوکی حەجی کرد. کاتێك گەیشتە مەدینە، لەسەر سفرەی بادەخواردن دانیشت. عەبداللە کوڕی عەباس و حسین کوڕی عەلی ڕۆشتنە بەردەرگای ماڵەکەی و داوایان کرد بچنە ژوور. دەڵێن: کوڕی عەباس بۆنی شەرابی کرد و ناسیەوە. یەزید سفرەکەی کۆکردەوە و فەرمانی بەحسیندا. کاتێك ڕۆشتە ژوور، هەستی بەبۆنی شەراب و گولاو کرد و وتی: ئەی خوایە، چەند گولاوێکی بۆنخۆشە، ئەم بۆنە لە کوێوە دێت؟.یەزید وتی: بۆنێکە کە لەشام دروستی دەکەن. دواتر پیاڵەیەکی بەرز کردەوە و خواردی. داوای پیاڵەیەکیتری کرد و وتی: دەرخواردی باوکی عەبداللەی بدە. حسین وتی: ئەی پیاو، خواردنەوەکەی کاری تۆیە، دەست لەمن هەڵگرە. یەزید وتی:

| | |
|---|---|
| الا یا صاح للعجب | دعوتك و لم تجب |
| الی الفتیات و الشهوا | ت و الصهباءو الطرب |
| با طیة مكلله | علیها سادة العرب |
| و فیهن التی تبلت | فوادك ثم لم تثب |

یانی: هاوڕێی من، سەیرە کە بانگم کردی و وەڵامت نەدامەوە، بۆ کچە گەنجەکان و خۆشی و خواردنەوە و گەمە. گۆزەیەکی سەرداخراو کە گەورەکانی عەرەب لەدەوری دانیشتون. لەناو کچەکان مانگ ڕوخسارێکە کە دڵی تۆی لەشەیدایدا شەیدا کرد و بەرەو لای نەڕۆشتیت.

حسین کوڕی عەلی هەستا و ڕۆشتەدەر و وتی: کوڕی معاویە، دڵت فریوی دایت.

## ڕوبەڕوبونەوەی عەبداللە کوڕی عەباس لەگەڵ یەزید

شەقیق کوڕی سەلە دەڵێت: کاتێك حسین کوژرا، عەبداللە کوڕی زوبەیر شۆڕشی کرد و داوای لە کوڕی عەباس کرد بەیعەتی لەگەڵ بکات. کوڕی عەباس ڕازی نەبو. یەزید گومانی دەکرد بەیعەت نەکردنی کوڕی عەباس لەگەڵ زوبەیر بۆ ڕێزگرتنە لەبەیعەتی کوڕی عەباس لەگەڵ خۆی. نامەی بۆ نوسی: دوای سلاو، بیستم کە ئەم بێ دینە، کوڕی زوبەیر، داوای بەیعەتی لێ کردویت و تۆ بۆ ڕێز گرتن لەبەیعەتەکەی ئێمە، ئاوڕت لێ

نەداوەتەوە. خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە کە خزمێکی چاك باشترین پاداشت دەدات بەو کەسانەی رێز لەپەیمانەکەی خۆیان دەگرن. هەر شتێك لەبیر بکەم، چاکەی تۆ لەبیر ناکەم و بەو ئەندازەی کەشیاوی زانایەکی گەورەی وەك تۆیە، هەر بەخششێکت پێ دەبەخشم، ئەو کەسانەی لەدەوروبەرەوە دێن و کوڕی زوبەیر فریویان دەدات، ئاگایان بکەرەوە چونکە خەڵك زیاتر لەتۆ فەرمان دەبەن تا ئەم پیاوە و گوێ لەوتەکانی تۆ دەگرن.

کوڕی عەباس بۆی نوسی: دوای سڵاو، نامەکەی تۆ بەدەستم گەیشت. بەڵام رازی نەبونی من بە بەیعەت لەگەڵ کوڕی زوبەیر، لەبەر ئەوە نەبو کە چاوەڕوانی چاکە و وەسفی تۆ بکەم. خوای لەوەی لەدڵی مندایە، ئاگادارترە. گومان دەکەیت چاکەی من لەیاد ناکەیت، داوات لێکردوم خەڵك بۆ چاکە لەگەڵ تۆ هان بدەم و بیانکەمە دوژمنی کوڕی زوبەیر و لەویان دوربخەمەوە. سوێند بەخوا هەرگیز. نە لەتۆ شادمانم، نە لای من کەسێکی بەرێزیت. چۆن دەبێت کە تۆ حسین و گەنجەکانی بنەماڵەی عەبدولموتەلیبت کوشت و چرای روناکی بەخشی خەڵکت کوژاندەوە و ئەستێرە درەوشاوەکانت خستە سەرزەوی. سوارەکانی تۆ ئەوانیان لەدەشتێکی چۆڵدا لەناو خاك و خوێندا بەجێهێشت و لەبیاباندا بەروتی فرێیاندان. ئەوان تینوی گیان بەخشین بون و ئەوسا نەکەس جل و بەرگی مەرگی لەبەر کردن و نە کەس سەرینێکی خستە ژێر سەریان و نە کەس دڵۆپێك ئاوی کردە سەر گۆڕەکەیان. باکان بەسەر ئەواندا هەڵیانکرد و کەمتیارەکانی بیابان چنگ و دیانیان بۆ تیژ دەکردن، سەرئەنجام ئەو کەسانەی ئەوانیان کوشتار نەکردبو، بەخۆشەویستی خوایی هاندران و کفنیان کردن و بەخاکیان سپاردن. لەروناکی من و ئەوان بو کە بەرێز بویت و لەجێگەی ئێستاتا دانیشتویت. هەر شتێك لەبیر بکەم، ئەوە لەبیر ناکەم کە حسینت لەبارەگایی پێغەمبەر دورخستەوە و رەوانەی بارەگایی خواییت کرد. بەسوپایەك هێرشت کردە سەر و ئەوەندە پەلامارتدا تا بۆ رۆشتن بۆ عێراق هانتدا. ئەو ترساو و چاوەڕوان هاتەدەر و روی لەو دیارە کرد. سوپاکەی تۆ هێرشیان کردە سەر و ئەمە لەسەر بنەمای کینەی دوژمنانەی تۆ بو کە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و بنەماڵەی پێغەمبەر هەتە کە خوا پیسی و ناپاکی لەوان سڕیوەتەوە و هەمویانی پاك و پاکیزە کردوە. داوای ئاگربڕی کرد و مەبەستی گەڕانەوەی کرد بەڵام ئێوە کەمی

هاورێیانی ئەو و لەناوبردنی بنەماڵەکەی ئەوتان لەسەردا پەروەردە دەکرد و بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو یەکتانگرت وەك بڵێی بنەماڵەیەك لەبتپەرستەکان یا ناباوەڕان کوشتار دەکەن. ئێستا شتێك لەوە سەیرتر نیە کە خوازیاری هاورێیەتی منیت لەگەڵ ئەوەی کوڕانی باوکمت کوشت و شمشێرت بەخوێنی من ئاشنا کرد. تۆیەکێك لەدوژمنانی منی. شادمان مەبە ئەگەر ئەمڕۆ بەسەر ئێمەدا سەرکەوتویت بێ گومان ڕۆژێك دەگات کە ئێمە بەسەر تۆدا سەردەکەوین. سڵاو و ماڵئاوا.

## وتارێك سەبارەت بەیەزید

ڕۆژێك لای شەریف ئەبو یەعلی حەمزە کوڕی محەممەد کوڕی جەعفەری عەلەوی ناوی یەزید برا. وتی: من یەزید بە ناباوەڕ نازانم چونکە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: داوام لەخوا کرد هیچ کەسێك لەخەڵکانی من نەکاتە فەرمانڕەوای ئەوان. خوا مەبەستەکەمی هێنایە دی.

## بەیعەت لەگەڵ معاویە کوڕی یەزید کوڕی معاویە

**بەیعەت لەگەڵ عەبدالله کوڕی زوبەیر کوڕی عەوام**

لەم ساڵەدا لەشام بۆ خەلافەت لەگەڵ معاویە کوڕی یەزید بەیعەتیان بەست و لەحیجاز لەگەڵ عەبدالله کوڕی زوبەیر. کاتێك یەزید مرد، هەواڵی ئەم کارە لەم مەککە بە کوڕی زوبەیر گەیشت و ئەمە پێش ئەوە بو کە حوصەین کوڕی ئەمیر و سوپاکەی لەم هەواڵە ئاگادار ببنەوە. بازنەی گەمارۆدانی خەڵکانی شام لەسەر عەبدالله بەهێز ببو. کوڕی زوبەیر و خەڵکانی مەککە هاواریان کرد: سەرکردەی ستەمکاران لەناوچوە، بۆچی شەڕ دەکەن؟ چ هیوایەکتان هەیە؟ خەڵکانی شام باوەڕیان بەوتەکانی ئەوان نەکرد.

کاتێك هەواڵی مەرگی یەزید بەحوصەین گەیشت، کەسی بۆ لای کوڕی زوبەیر ڕەوانە کرد و وتی: شوێنی کۆبونەوەی ئێمە ئەمشەو لەپشتی تەپۆڵکەکانی دەرەوەی شار بێت. ئەو دوانە یەکیان بینی و گفتوگۆیان کرد. ئەسپەکەی حوصەین تەرسەقولی کرد وکۆترەکانی بارەگا هاتن تا لەناو تەرسەقولەکان چینە بکەن. حوصەین جڵەوی ئەسپەکەی خۆی لەبەرابەر ئەوان کێشایەوە و وتی: دەترسم ئەسپەکەم کۆترەکانی بارەگا بکوژێت. کوڕی زوبەیر وتی: لەم کارە خۆتان بەدور دەگرن و موسوڵمانان لەناو بارەگادا

دەکوژن؟ لەو قسانەی حوصەین بە کوڕی زوبەیری وت، ئەمە بو کە: تۆ بۆ ئەم کارە شیاوتریت، با لەگەڵ تۆدا بەیعەت بکەین، دواتر لەگەڵ ئێمە وەرە بۆ شام کە هەموان بێ چەند و چون بەیعەتت لەگەڵ دەبەستین چونکە ئەو سوپای کە لەگەڵ مندایە، شەرکەران و گەورەکانی خەڵکی شامن. سوێند بەخوا کەسیان پشت ناکاتە هاوکاری کردنی تۆ، ئەمان بەخەڵك دەبەخشیت و لەو خوێنانە خۆش دەبیت کە لەناو سوپاکەی من و خەڵکانی مەککە رژاوە. کوڕی زوبەیر وتی: ئەم خوێنانە بەفیڕۆ نادەم وتەنانەت بەمەیشڕازی نیم کە بۆ هەر یەك کەس لەوان دەکەس لەئێوە بکوژم. حوصەین ئارام و بەنهێنی قسەی لەگەڵ دەکرد و کوڕی زوبەیر دەنگی خۆی بەرز دەکردەوە و دەیوت: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم. حوصەین وتی: خوا قێزەون بکات ئەو کەسەی لەمەودوا تۆ بەوشیار و فرەزان بزانێت. گومانم دەکرد ئەندێشەیەکت لەمێشکی خاڵی خۆتدا پەروەردە کردوە. من بەنهێنی قسەت لەگەڵ دەکەم و تۆ هاوار دەکەیت، پێشنیاری فەرمانڕەواییت پێ دەکەم و تۆ ڕێگەی کوشتار و ناسازگاری دەگریتەبەر. دواتر لێی جیابویەوە و هاورێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو مەدینە بەرێکەوت. کوڕی زوبەیر لەوەی کردی، پەشیمان بویەوە و کەسی بەدوای حوصەیندا رەوانە کرد و پەیامیدا کە: ئێمە بەهاتن بۆ شام رازی نابین و بەڵام بەیعەت، دەتوانن لێرە بەیعەت لەگەڵ ئێمە بکەن کە ئەمانتان پێ دەبەخشم و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس و کەوتتان لەگەڵ دەکەم و بەدادپەروەریەوە فەرمانڕەوایی ئێوە دەگرمە ئەستۆ. حوصەین وەڵامی دایەوە: ئەگەر خۆت نەیێت، ئەم کارە سەرناگرێت چونکە لەناو ئومەوییەکان کەسانێك هەن کەخوازیاری ئەم کارەن.

حوصەین بەرەو مەدینە بەرێکەوت و خەڵکانی مەدینە بەسەر شامیەکان بوێربون. هیچ کەس لەوان بەتەنیایی بۆ جێگەیەك نەدەرۆشت مەگەر ئەوەی ئەسپەکەیان دەگرت و دەیانهێنایە خوار. ئەوان بڵاو نەبونەوە. ئومەوییەکان لەگەڵ ئەوان بەرەو شام بەرێکەوتن. ئەگەر کوڕی زوبەیر لەگەڵ ئەوان دەرۆشت، بۆ فەرمانبەری لەو هاودەنگ دەبون.

خەڵکانی شام گەیشتنە دیمەشق و بینیان خەڵك لەگەڵ معاویە کوڕی یەزید بەیعەتیان بەستوە. ئەو تەنیا سێ مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد و دواتر مرد. دەستەیەك دەڵێن: چل

ڕۆژ پاشایەتی کرد و مرد. ساڵەکانی تەمەنی بیست ویەك ساڵ و هەژدە ڕۆژ بو.
کاتێك گەیشتە دوایین ڕۆژەکانی ژیانی خۆی، فەرمانیدا و هاواریان کرد: نوێژی گشتیە. خەڵك کۆبونەوە و ئەو قسەی بۆ کردن. سوپاسی خوای کرد و وصفی کرد و وتی: دوای سڵاو، من لەکارەکەی ئێوەدا تیاماوم، هاوشێوەی عومەر بەدوای کەسێکدا گەڕام تا وەك ئەبوبەکر بیهێنمە سەر کار، بەڵام کەسم دەستنەکەوت. مەبەستی ئەوەم کرد شەش کەس هاوشێوەی عومەر بۆ ڕاوێژ کردن هەڵبژێرم بەڵام دەسم نەکەوت. ئێستا خۆتان شارەزاترن، هەرکەسێکتان دەوێت بیکەنە فەرمانڕەوای خۆتان. دواتر گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی و خۆی داشارد تا مرد.
دەستەیەك دەڵێن: ئەویان ژەهرخوارد کرد. وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبو سوفیان نوێژی لەسەر خوێند. ئەویش هەمان ڕۆژ گیرۆدەی نەخۆشی تاعون بو و مرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو نەمرد. معاویە پێشنیاری کرد زەحاك کوڕی قەیس لەگەڵ خەڵك نوێژ بخوێنێت تا فەرمانڕەوا دەست نیشان بکەن. بەمعاویەیان وت: کەس وەك جێگری خۆت دەستنیشان ناکەیت؟ وتی: کەسێك نیم تاڵیەکەی بچێژم و شیرینیەکەی بۆ بەنی ئومەییە بەجێبێڵم.

## ڕۆژگاری عوبەیدالله کوڕی زیاد دوای مەرگی یەزید

یەزید مرد و حومران کۆیلەی عوبەیدالله کەنێردراوی ئەو بۆ دەرباری معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بو، هەواڵی مەرگی یەزیدی بۆ کوڕی زیاد هێنا. ئەو وەك نوێنەری کوڕی زیاد لای یەزید هەژمار دەکرا. کاتێك ئەم هەواڵەی هێنا، بەشێوەیەکی نهێنی بەکوڕی زیادی وت و ئاگاداری کردەوە کە خەڵکانی شام گیرۆدەی بەربڵاوی و پەرێشانین. فەرمانیدا و هاواریان کرد: نوێژی گشتیە. خەڵك کۆبونەوە و ئەو ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و هەواڵی مەرگی یەزیدی ڕاگەیاند و بەخراپی ناوی برد و سەرکۆنەی کرد. ئەحنەف کوڕی قەیس هەستا و وتی: بەیعەتی یەزید لەئەستۆی ئێمەدایە. ئاماژەیان بەوەداوە کە: لەوتنی قسە پڕژ و بڵاوەکان خۆتان بەدور بگرن. عوبەیدالله پشتی تێکرد و وتی: ئەی خەڵکانی بەسرە، کۆچ کردنی ئێمە بۆ لای ئێوە بو و ماڵی ئێمە لەنێوان ئێوە و زادگای من شارەکەی ئێوە. کاتێك بومە فەرمانڕەوای ئێوە، ئێوە شەڕکەرانتان زیاتر لەحەفتا هەزار کەس نەبو کە ئەمڕۆ نزیکەی سەد هەزار کەسە. دیوانی

کارگوزارانی ئێوە تەنیا نەوەد هەزار کەسی لەخۆ دەگرت و ئێستا نزیکەی سەد و چل هەزار کەس لەخۆ دەگرێت. هیچ ئاژاوەگێرێك کە ببێتە هۆی ئاژاوە بۆتان، بەجێم نەهێشت مەگەر ئەوەی خستمە زیندان. یەزید مردوە و خەڵکانی شام گرفتاری دوبەرەکی بون. ئێوە ئەمرۆ گەورەترین شار، بەربڵاوترین سەرزەمین، بەتواناترین کەسەکانن. بۆ خۆتان کەسێك هەڵبژێرن کە بۆ دین و کۆمەڵانی خەڵك پەسندی بکەن. من یەکەم کەسم بەیعەت لەگەڵ کەسێك دەبەستم کە ئێوە بەیعەتی لەگەڵ ببەستن. ئەگەر خەڵکانی شام بەیعەتیان لەگەڵ کەسێك بەست کە بۆ دین و کۆمەڵانی خەڵك پەسندتان کرد، ئێوەش هاورای موسوڵمانان بن و ئەگەر پەسەندتان نەکرد، لەسەر کردارەکانی خۆتان بمێننەوە تا مەبەستەکانتان بێتەدی. ئێوە پێویستیتان بەخەڵکی هیچ کام لەشارەکان نیە بەڵام خەڵکانیتر نیازمەندی ئێوەن. وتاردەرانی خەڵکی بەسرە هەستان و وتیان: وتارەکەی تۆمان بیست بەڵام کەس شیاوتر و بەهێزتر لەتۆ بۆ ئەم کارە ناناسین. با لەگەڵ تۆ بەیعەت بکەین. وتی: من پێویستم بەوە نیە. سێ جار دوبارەیان کردەوە و ئەو خۆی بەدور گرت. دواتر دەستی درێژ کرد و خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ کرد و بەدوای کارەکانی خۆیاندا ڕۆشتن و لەکاتی ڕۆشتن دەستیان بەدیوارەکان دەسو و بەیعەتەکەیان لێ پاك دەکردەوە و وتیان: ئایا کوڕی مەرجانە گومان دەکات لەهەر دوکات، (یەکگرتویی و بەربڵاوی) ملکەچی فەرمانەکانی دەبین.

کاتێك خەڵکانی بەسرە بەیعەتیان لەگەڵ کرد، عەمرۆ کوڕی میسمەع و سەعد کوڕی قورحای تەمیمی رەوانەی لای کوفیەکان کرد تا ئەوان لەکاری خەڵکی بەسرە ئاگادار بکەنەوە و پێشنیاری بەیعەتیان پێ بکەن. کاتێك گەیشتنە کوفە، عەمرۆ کوڕی حوریس کەجێگری ئەو لەم شارەدا بو، خەڵکی کۆکردەوە و دو نێردراوەکە هەستان و قسەیان بۆ خەڵك کرد و لەهەواڵەکان ئاگاداریان کردنەوە. یەزید کوڕی حارس کوڕی یەزیدی شەیبانی ناسراو بەناوی (کوڕی رویەم) هەستا و وتی: سوپاس بۆ خوا کەئێمەی لەدەست کوڕی سومەیەیی روسپی ئاسودە کرد! ئێمە بەیعەتی لەگەڵ بکەین؟ بەیعەت ناکەین و بەهیچ شێوەیەك ڕێزی لێ ناگرین. ئەو یەکەم کەس بو وردە بەردی گرتە دو نێردراوەکە و دواتر خەڵکانیتر ئەوانیان بەردباران کرد. ئەم کارە پێگەی یەزید کوڕی رویەمی لەناو خەڵکی کوفە بەرز کردەوە.

دو نێردراوەکە بۆبەسرە گەڕانەوە و هەواڵی ئەم کارەیان پێ ڕاگەیاند. خەڵکانی بەسرە وتیان: ئایا خەڵکانی کوفە ئەو لەسەر کار لاببەن و ئێمە پێگەی بەرز بکەینەوە. شکۆی ئەو لەناو خەڵکان بەرەو لاوازی ڕۆیشت بەشێوەیەك فەرمانی دەدا و جێبەجێیان نەدەکرد و کاتێك بۆچونێکی دەردەبڕی، پشت گوێیان دەخست و ئەگەر فەرمانی زیندانی کردنی گوناحکارێکی دەدا، خەڵك ڕێگریان لەپاسەوانەکان دەکرد.

دواتر سەلە کوڕی زوەیبی حەنزەلی بە ئاڵایەك لەدەست هاتە بەسرە و لەناو بازاردا وەستا و جاڕیدا: ئەی خەڵکینە، کۆببنەوە، پێشنیاری کارێکتان پێ دەکەم کە پێشتر کەس ئەو پێشنیارەی پێنەکردون. داوای فەرمانبەری پەنابەری ماڵی خوا (عەبدالله کوڕی زوبەیرتان) لێدەکەم. ئەو کەسانەی لەدەوری کۆببونەوە، دەستیان خستە ناو دەستی و بەیعەتیان لەگەڵ کوڕی زوبەیر کرد. ئەم هەواڵە بە کوڕی زیاد گەیشت. ئەو خەڵکی کۆکردەوە و قسەی بۆ کردن و کاروباری خۆی لەگەڵ ئەواندا باس کرد و وتی من داوای فەرمانبەری کردنی کەسێکم لێکردن کە پەسەندی بکەن و ئێوە بەیعەتتان لەگەڵ من کرد و تەنیا بەفەرمانڕەوایی من ڕازی بون. زیادی کرد: بیستومە دەستان بەدیوارەکاندا هێناوە و دەستی خۆتان لەبەیعەتەکەی من پاك کردۆتەوە و ئەمە و ئەوەتان هێناوەتە سەر زمان. فەرمان دەدەم و فەرمانەکانم کاری پێ ناکرێت و بۆچونەکانم بۆ خۆم دەگەڕێتەوە و هاورێکانی من لەئەنجامدانی ئەرکەکانیان بەدور دەگرن. ئێستا سەلە کوڕی زوەیب هاتوە و ئێوە بۆ ناسازگاری لەگەڵ یەك هان دەدات تا کۆمەڵانی خەڵك پرژ و بڵاو بکات و ئاژاوەیەك بنێتەوە کە دواهاتەکەی ئێوە بەشمشێر سەری یەکتر بپەڕێنن.

ئەحنەف و خەڵك وتیان: سەلە دەهێنینە لای تۆ. سەلەیان برد و بینیان شوێنکەوتەکانی فراوان بون. کاتێك ئەمەیان بینی، لەدەوری کوڕی زیاد بڵاوەیان لێکرد وئەو بەتەنیا مایەوە. عەبدالله گەورەکانی ئەیاری ناسازگارانی پاشای کۆکردەوە و داوای هاوکاری لێکردن تا شەڕ لەگەڵ دوژمنان بکەن. وتیان: ئەگەر دڵمان پێمان بڵێت، ئەو کارە دەکەین. براکانیان پێیان وتن: خەلیفەیەك لەئارادا نیە کەئەگەر شکەستت خوارد، پەنای بۆ ببەیت و ئەو بەهێزەکانی خۆی هاوکاریت بکات، ئەگەری هەیە شەڕ لەزیانی تۆ کۆتایی پێ بێت. ئێمە لەناو ئەم خەڵکەدا سامانی زۆرمان دەستکەوتوە و زێڕ و زیوی فراوانمان لەبەردەستایە کەئەگەر بەسەرماندا زاڵبن، لەناومان دەبەن وئەو سامانە بەفیڕۆ

دەدەن و هیچ بیانوێك بۆ تۆ نامێنێتەوە و هاورێكانت لەدەورت كۆنابنەوە.

كاتێك ئەمەی بینی، كەسی بۆ لای حارس كوڕی قەیس كوڕی سەهبای جەهزەمی ئەزدی رەوانە كرد و پێی وت: ئەی حارس، باوكم پێشنیاری پێكردوم ئەگەر رۆژێك پێویستی كرد هەڵبێم، ئێوە هەڵبژێرم. حارس وتی: خەڵكانی من باوكی تۆیان تاقی كردۆتەوە و لای ئەو پێگە و لای تۆ پاداشتێكیان دەست نەكەوتوە، بەڵام ئەگەر ئێمە هەڵبژێریت، پشت گوێت ناخەم. نازانم ئەمان بەخشینی من بەتۆ بەكوێ دەگات. ئەگەر لەرۆژی روناك بتبەمەدەر، دەترسم بتكوژن و منیش هاورێ لەگەڵ تۆ. بەڵام ئەمرۆ تا شەو لەگەڵت دەمێنمەوە و دواتر لەپشت سەری خۆم سوارت دەكەم تا نەتناسنەوە. عوبەیداللە پەسندی كرد. لەگەڵی مایەوە و كاتێك شەو داهات، لەپشت سەری خۆی سواری كرد.

لەگەنجینە نۆزدە هەزار هەزار (نۆزدە ملیۆن) درەم بەجێ مابو كە كوڕی زیاد بەشێكی بەسەر كۆیلە و خزمەكانی خۆیدا دابەش كردبو و پاشماوەكەی كۆكردەوە تا بۆ بنەماڵەی زیاد بەجێ بمێنێت.

حارس، عوبەیداللە كوڕی زیادی لای خەڵكەوە بردەدەر و ئەوان لەترسی حروریەكان و سەبەئیەكان پاسەوانیان لێدەكرد. عوبەیداللە دەیپرسی: ئێستا لەكوێین؟ حارس ئاگاداری دەكردەوە. كاتێك گەیشتنە ناو بەنی سولەیم، وتی: لەكوێین؟ وتی: لەناو بەنی سولەیم. وتی: بەویستی خوا رزگارمان بو. كاتێك گەیشتنە ناو بەنی ناجیە، پرسی: لەكوێین؟. وتی: لەناو بەنی ناجیە. كوڕی زیاد وتی: بەویستی خوا رزگارمان بو. بەنی ناجیە پرسیان: كێیت؟ وتی: حارس كوڕی قەیس. پیاوێك لەوان كوڕی زیادی ناسیەوە و وتی: كوڕی مەرجانەی روسپی! تیرێكی هاویشت كە بەردەستارەكەی كوڕی زیاد كەوت.

حارس ئەوی برد و لەماڵەكەی خۆی لەجەهازم دایبەزاند. كوڕی زیاد وتی: ئەی حارس، چاكەت لەگەڵ من كرد، ئێستا ئەوەی دەیڵێم ئەنجامی بدە. تۆ پێگەی مەسعود كوڕی عەمرۆ لەناو خەڵكەكەی دەزانیت و لەگەورەیی و بەتەمەنی ئەو و فەرمانبەری خەڵكەكەی ئاگاداریت. ئایا شیاو نیە من ببەیتە لای ئەو؟ من لەماڵەكەی ئەودابم كە لەناو خەڵكانی ئەزدە. ئەگەر ئەم كارە نەكەیت خەڵكەكەت كاروبارەكانت لێ دژوار دەكەن. حارس ئەوی هەڵگرت و هەردوكیان رۆشتنە لای مەسعود وئەو ئاگادار نەبو و دانیشتبو و پێڵاوەكەی خۆی پینە دەكرد. كاتێك ئەم دوانەی بینی، هەردوكیانی

ناسیەوە. بەحارسی وت: لەو زیانەی شەوانە هێناتە سەر سەرم، پەنا بۆ خوا دەبەم. وتی: تەنیا چاکەم بۆ هێناویت. تۆ دەزانی خەڵکەکەت زیادیان رزگار کردو چاکەیان لەگەڵدا کرد و ئەمە بوە هۆی ئەوەی لەناو عەرەبەکاندا شانازی بەخۆیانەوە بکەن. ئێوەیش بەرەزامەندی بەیعەتتان لەگەڵ عوبەیدالله کرد و بەیعەتێکی گشتی دیکەتان لەگەڵ بەست. مەسعود وتی: ئایا دەڵێیت لەسەر عوبەیدالله لەگەڵ خەڵکی شارەکەمان شەڕ بکەین؟ لە باوکی نە پاداشتمان بینی، نەسوپاس. کەواتە چ سود لەوەی کردمان؟ حارس وتی: کەس لەبەر ئەمە سەرکۆنەی تۆ ناکات کە لەسەر بەیعەتەکەی خۆت بمێنیتەوە و بیگەیینیتە شوێنێك کەرزگاری بێت. ئێستا هاتۆتە ماڵەکەی تۆ، ئایا دەری دەکەیت؟

مەسعود فەرمانی پێدا تا بڕواتە ماڵی براکەی عەبدولغافر کوڕی عەمرۆ. مەسعود هەمان شەو بەرێکەوت و حارس و دەستەیەك لەخەڵکەکەی کردە هاورێی خۆی. ئەوان لەناو خەڵکانی ئەزد سوڕانەوە و وتیان: کوڕی زیاد ونبوە و ئێمە ئاسودە نین کە بۆ دۆزینەوەی ئەو چاودێری ئێوە بکەن. کاتێك بەرەبەیانی نزیك بویەوە، هەمو خەڵکانی ئەزد کەرەستەی شەڕیان هەڵگرتبو. خەڵك کوڕی زیادیان ون کرد و وتیان: ئەو تەنیا لەناو خەڵکی ئەزددایە.

دەڵێن: حارس هیچی بەمەسعود نەوت، بەڵکو فەرمانی بەعوبەیداللەدا سەد هەزار درەم لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت. ئەو درەمەکانی بردە لای دایکی بەستام هاوسەری مەسعود.، ئەو کچی عەمرۆ کوڕی حارس بو. عوبەیدالله کوڕی زیاد هاورێیەتی حارسی دەکرد. داوای فەرمانی لێکرد و ژن فەرمانی پێدا. حارس بەژنەکەی وت:. بۆ کارێك هاتومەتە ماڵەکەی تۆ چونکە سەروەری ژنانی عەرەبیت و بەزویی سامانی زۆرت دەستدەکەوێت. ژنەکەی لەکاروبارەکان ئاگادار کردەوە. فەرمانی پێدا کە کوڕی زیادی بردە ناو ماڵەکەی و جلوبەرگی مەسعودی لەبەر کرد. ژن ئەو کارەی کرد. کاتێك مەسعود گەڕایەوە، سەری ژنەکەی گرت و بەمشت لێی دەدا. حارس و عوبەیدالله هاتنەدەر و عوبەیدالله پێی وت: ژنەکەت ئەمانی پێ بەخشیم و ئەمە جلی تۆیە لەبەرمندایە و خواردنی تۆیە لەسکی مندایە. حارس شایەتی دا و ئەوان بەمیهرەبانیەوە قسەیان لەگەڵ کرد تائارام بویەوە و رازی بو. کوڕی زیاد لەماڵەکەی ئەودابو تا مەسعود کوژرا و دواتر بۆ شام کۆچی کرد.

کاتێك کوڕی زیاد ون بو، خەڵکانی بەسرە بێ فەرمانڕەوا مانەوە. لەمبارەوە ناسازگاری

لەناویاندا دروست بو کە چ کەسێك بۆ ئەو کارە دەستنیشان بکەن. دواتر بەداوەری قەیس کوڕی هەیسەمی سولەمی و نەعمان کوڕی سوفیانی راسبی رازی بون تا کەسێکیان وەك فەرماندار بۆ هەڵبژێرن. قەیس بەکرێگیراوی ئومەوییەکان و نەعمان شەیدای هاشمیەکان. نەعمان وتی: کەس لەفلاّن کەس بەشیاوتر نابینم (ئەو پیاوێك لەئومەوییەکان بو). دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو نەعمان عەبدالله کوڕی ئەسوەدی زوهری ناوبرد کەقەیسیش پەسندی کرد. نەعمان بەفێڵ ئەم قسەی هێنایە سەرزمان. قەیس وتی: دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی تۆ و هەر کەسێك هەڵبژێریت، پەسندی دەکەم. دواتر رۆشتنە لای خەڵك و قەیس وتی: من ئەو کەسە پەسند دەکەم کە نەعمان پەسندی بکات.

## فەرمانداری عەبدالله کوڕی حارس

کاتێك قەیس و نەعمان رێککەوتن و قەیس رازی بو بەوەی هەر کەسێك نەعمان پەسندی بکات، پەسندی بکات، نەعمان خەڵکی بەشایەت وەرگرت و لەخەڵك و قەیس پەیمانی وەرگرت کە بەهەڵبژاردەکەی ئەو رازی دەبن. دواتر رۆشتە لای عەبدالله کوڕی ئەسوەد و دەستی ئەوی گرات و مەرجەکانی خۆی باس کرد بەشێوەیەك خەڵك گومانیان دەکرد لەگەڵ ئەو بەیعەت دەکات. دواتر دەستی ئەوی بەردا و دەستی حارس کوڕی نەوفل کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب ناسراو بە (بەبەی) گرت و مەرجەکانی لەگەڵ باس کرد. دواتر ناوی خوای هێنایە سەرزمان و سوپاسی کرد و سلاّوی بۆ پێغەمبەر نارد وئاماژەی بەماق کەسان و بنەماڵەکەی ئەودا و وتی: ئەی خەڵکینە چ ئیرادێك لەپیاوێك لەکوڕە مامەکانتان دەگرن کە دایکی هند کچی ئەبوسوفیانە و کارەکان لەدەست ئەم بنەماڵەدا بوە. ئەو خوشکەزای ئێوەیە. دواتر دەستی گرت و وتی: ئەوم هەڵبژارد. خەڵك هاواریان کرد: رازین. بەیعەتیان لەگەڵ کرد و ئەویان بۆ کۆشکی فەرمانداری برد. ئەمە لەسەرەتایی جەمادی الثانی ساڵی ٦٤/ ٢٥ ژانویەی ٦٨٤ زایینی بو. فەرزدەق سەبارەت بەم بەیعەت وتی:

و بايعت اقواما و فيت بعهدهم     و ببة قد بايعته غير نادم

یانی: لەگەڵ کەسانێك بەیعەتم بەست و رێزم لەپەیمانەکەیان گرت و لەگەڵ بەبە بەیعەتم کرد و پەشیمان نەبومەوەوە.

## هەڵاتنی کوڕی زیاد بۆ شام

دواتر خەڵکانی ئەزد و خەڵکی ڕەبیعە پەیمانەکەی نێوان خۆیان تازە کردەوە و کوڕی زیاد سامانی زۆری بەخشی تا پەیمانەکە کۆتایی هات و ئەوان لەمبارەوە دو نوسراویان نوسی کە یەکیان لای مەسعود دەپارێزرا. کاتێك ئەحنەف ئەمەی بیست، داوای لەخەڵکی ڕەبیعە کرد ئەو کارە بکەن. وتی: کاتێك دەڕۆنە لای ئەوان، بەردەوام شوێنکەوتەی ئەوان بن. کاتێك بونە هاوپەیمان، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە کوڕی زیاد بۆ کۆشکی فەرمانداری بگەڕێننەوە. بەرێکەوتن و سەرکردەی ئەوان مەسعود کوڕی عەمرۆ بو. بەکوڕی زیادیان وت: لەگەڵ ئێمەدا بەرێکەوە. کوڕی زیاد ڕازی نەبو و لەبەرابەر چەند کەسێك لەکۆیلەکانی خۆی وەك فەرماندەی سوارەکان ڕەوانە کرد و وتی: هیچ وتارێك لەچاك و خراپ نەهێننە سەرزمان مەگەر ئەوەی منی لێ ئاگادار بکەنەوە. مەسعود لای هەر هۆزێك تێدەپەڕی یا کارێکی دەکرد، یەکێك لەو کۆیلانە هەواڵەکەی بۆ کوڕی زیاد دەهێنا. خەڵکی ڕەبیعە بەفەرماندەیی مالك کوڕی مسمەع ڕەوانە بون و کۆڵانی مێربەدیان گرت. مەسعود هات و ڕۆشتە ناو مزگەوت و لەسەر تەختی وتاردان دانیشت و خەڵك بەهەمان شێوە پەرێشان بون و عەبداللە کوڕی حارس لەناو کۆشکی فەرمانداری. پێیان وت: مەسعود و خەڵکی یەمەن و کەسانی ڕەبیعە ڕەوانە بون و ئەگەری هەیە زیان و ئاژاوەیەکی سەراسەری لەناو خەڵکدا دروست ببێت. باشترە لەگەڵ ئەوان ئاشتی بکەیت یا ڕێبەرایەتی بەنی تەمیم لەئەستۆ بگریت و بەهاوکاری ئەوان هێرشیان بکەیتە سەر. وتی: خوا دوریان بخاتەوە، نا، سوێند بەخوا بۆ چاك کردنی ئەوان خۆم بەفیڕۆ نادەم! یەکێك لەپیاوەکانی مەسعود بەردەوام دەیوت:

لا نكحن ببة          جارية في قبه

تمشط راس لعبه

یانی: بەم زوانە کچێکی خێوەت نشین دەکەینە هاوسەری بەبە کە بەردەوام پرچە درێژەکانی خۆی شانە دەکات.

ئەمە، وتاری خەڵکانی ئەزدە. موزەریەکان دەڵێن: دایکی بو گەمەی لەگەڵ دەکرد و ناچاری دەکرد ئەو هۆنراوەیە بێنێتە سەرزمان.

مەسعود ڕۆشتە سەر مینبەر و مالك کوڕی میسمەع بەرەو ماڵەکانی بەنی تەمیم ڕەوانە

بو تا گەیشتە گەڕەکی بەنی عەدویە و ماڵەکانی ئەوانی ئاگرتێبەردا. ئەم کارەی بۆ تۆڵەسەندنەوە لەکوڕی خازم بو چونکە خەڵکی رەبیعەی لەهەرات لەبەخششەکانی خۆی بەهرەمەند دەکرد. بەنی تەمیم ڕۆشتنە لای ئەحنەف کوڕی قەیس و وتیان: خەڵکی ئەزد و رەبیعە هاوپەیمان بون و رویان کردۆتە گۆڕەپانی ناوەڕاستی شار. ئەحنەف وتی: ئێوە بۆ ڕۆشتنە ناو مزگەوت لەوان شیاوتر نین. وتیان: ڕۆشتنە ناو کۆشکی فەرمانداری. وتی: ئێوە بۆ گرتنی کۆشك لەوان شیاوتر نین. لەم کاتەدا هاوسەرەکەی ئاگردانێکی بۆ هێنا و پێی وت: تۆ کارت بەشەڕ وئەم کارانە چیە، تۆ ژنێکیت تەنیا شیاوی لای ئاگردانیت! ئەحنەف وتی: قونی ژن بۆ ئاگردانی شیاوترە! هیچ وتارێکی تاڵتریان لەمە لەو نەبیستبو. دواتر هاتنە لای و وتیان: پاوانەیان لەپێی یەکێك لەژنەکانی ئێمە داکەند، رەنگرێژەکەی سەر رێگەی تۆیان کوشت، پیاوێکی پەککەوتەیان لەبەردەم دەرگای مزگەوت لەناو برد و مالك کوڕی میسمەع هێرشی کردە سەر بەنی عەدویە و هەمو شوێنێکی سوتاند. ئەحنەف وتی: بۆ ئەم هەواڵانە شایەت و بەڵگە بێنن چونکە بەکاری سوکتر لەمە شەڕ لەگەڵ ئەوان رەوا دەبێت. شایەتیان دا کە ئەوەی باسیان کرد، رویداوە. ئەحنەف وتی: ئایا عوباد کوڕی حوصەین هاتوە؟ وتیان: نە. ئەو عوباد کوڕی حوصەین کوڕی یەزید کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەوس لەبەنی عەمرۆ کوڕی تەمیم بو. دواتر وتی: ئایا عوباد هاتوە؟ وتیان: نە. وتی: ئایا عەبەس کوڕی تەڵق کوڕی رەبیعەی سورەیمی لەبەنی سەعد کوڕی زەید مەنات کوڕی تەمیم لێرەیە؟ وتیان: بەڵێ. ئەوی بانگ کرد و دەستارەکەی سەری کردەوە و کردی بەنوکی ڕمێك و پێدا و وتی: بەرێکەوە. کاتێك بەرێکەوت، وتی: ئەی خوایە، ئەم ئاڵایە ریسوا مەکە، بەهەمان شێوە کە لەرابردودا ریسوات نەکردوە. خەڵك هاواریان کرد: زەبرا تورە بو. زەبرا دایکی ئەحنەف بو کە مەبەستی ئەوان لەدایك، خۆی بو.

عەبەسیەکان ڕۆشتنە ناو مزگەوت. کاتێك عەبەس بەرێکەوت، عوباد هات و وتی: خەڵك چیان کرد؟ وتیان: لەگەڵ عەبەس بەرێکەوتن. وتی: من ناچمە ژێر ئاڵای عەبەس. ئەو هاورێ لەگەڵ شەست سوار بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە. کاتێك عەبەس گەیشتە مزگەوت، ئەزدیەکان بۆ شەڕ روبەروی بونەوە. مەسعود لەسەر تەختی وتاردان بو و هانی خەڵکی دەدا. غەتەفان کوڕی ئەنیفی تەمیمی شەڕی دەست پێکرد و بەردەوام

دەیوت:

یال تمیم انها مذکوره ان فات مسعود بها مشهوره

فاستمسکوا بجانب المقصوره

یانی: ئەی خەڵکانی تەمیم، ئەمە شەڕێکە بەردەوام بیری دەکەنەوە. مەسعود ئەم کارە ناوداری لەبیر ناچێت، ئەو هەرگیز راناکات تا کاروبارەکان لەدەستی دەربچێت، کەواتە کەنارەکانی هەیوان بگرن.

ئەوان هێرشیان کردە سەر مەسعود و ئەویان لەسەر تەختی وتاردان هێنایە خوار و کوشتیان. ئەمە، رۆژی یەکەمی شوالی ساڵی ٦٤/ ٢٢ مەی ٦٨٤ زایینی بو. هاورێکانی هەڵاتن و ئەشیم کوڕی شەقیق کوڕی سەوریش رایکرد. کەسێکی ڕمێکی بۆ هاویشت، بەڵام رزگاری بو. فەرزدەق وتی:

لو ان اشیم لم اسنتنا و اخطا الباب اذ نیراننا تقد

اذا لصاحب مسعودا و صاحبه و قد تهافتت الاعفاج و الکبد

یانی: ئەگەر ئەشیم پێش ڕمەکانی ئێمە نەدەکەوت و کاتێك ئاگرەکەمان بڵێسەی دەسەند، ئەو دەرگای ون نەدەکرد، ئێستاکە هاورێی مەسعود دەبو و ئەویش دەیتوانی ئەم ببینێت. ئەمە لەکاتێکدا بو کە گەورەکان چابوك و چالاك و خەڵکانی جگەرخۆر هاوشێوەی گەڵای دار دەرژانە سەر زەوی.

بەڵام مالك کوڕی میسمەع، دەستەیەك لەموزەرییەکان هاتن و ئەویان لەناو ماڵەکەیدا گرت و ماڵەکەیان سوتاند. کاتێك کوڕی زیاد رایکرد، دەستەیەك شوێنی کەوتن بەڵام ئەوانی لەگرتنی خۆی ناتەوان کرد و ئەمان نەیانتوانی پێی بگەن. لەبەر ئەمە هەمو سامانەکەی ئەویان تاڵان کرد. واقید کوڕی خەلیفەی تەمیمی لەمبارەوە وتی:

یا رب جبار شدید کلبه قد صار فینا تاجه و سلبه

منهم عبیدالله یوم نسلبه جیاده و بزه و ننهبه

یوم التقی مقنبنا و مقنبه لو لم ینج ابن زیاد هربه

یانی: چەندە زۆرن ئەو ستەمکارە سەختگیرانەی کە تاج و کەرەستەکانی شەڕ و جل و بەرگەکەی بەئێمە گەیشت، یەکێك لەوان عوبەیدالله کوڕی زیاد بولەو رۆژەی کەتاڵانمان کرد و ئەسپ و جلەکانیمان رفاند و سامانەکەیمان بەفیرۆدا. ئەو رۆژەی سوارە هێرش

بەرەکانی ئێمە روبەروی سوارەکانی ئەو بونەوە، خۆزگە هەڵاتن کوڕی زیادی رزگار نەدەکرد.

سەبارەت بەکوژرانی کوڕی مەسعود و هەڵاتنی کوڕی زیاد ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکیتریش داوە کە لەگەڵ ئەوەی باسمان کرد یەك ناگرێتەوە. دەڵێن: کوڕی زیاد پەنای بۆ مەسعود کوڕی عەمرۆ برد، ئەوی پەنادا. دواتر کوڕی زیاد بەرەو شام کەوتە رێ و مەسعود سەد پیاوی شەڕکەری لەخەڵکانی ئەزد کردە هاورێ کە ڕۆشتن و ئەویان گەیاندە شام. شەوێك کە بۆ پێشەوە دەڕۆیشت، وتی: وشتر سواری بۆ من دژوارە و من بەتەواوی هیلاك بوم. ئەویان سواری ئەسپ کرد. دواتر راخەرێکیان خستە سەر کۆپانی کەرێك و سواری کەرەکەیان کرد کە بەرێکەوت و بێدەنگی هەڵبژارد.

موسافیر کوڕی شورەیحی یەشکری دەڵێت: بەخۆم وت، ئەگەر خەوتبێت، خەوەکەی دەشێوێنم. لێی نزیك کەوتمەوە و وتم: خەوتویت؟ وتی: نە، قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد. پێم وت: پێت بڵێم لەگەڵ خۆت باسی چیت دەکرد؟ وتی: بیڵێ. وتم: بەردەوام دەڵێی خۆزگە حسینم نەدەکوشت. وتی: چیتر؟ وتم: بەردەوام دەڵێیت، خۆزگە ئەوانەی لەناوم بردن، نەمدەکوشتن. وتی: چیتر. وتم: تۆ دەتوت: خۆزگە کۆشکی سپیم دروست نەدەکرد. وتی: چیتر. وتم: بەردەوام دەڵێیت: خۆزگە دێهاتیەکانم نەدەهێنایەر سەرکار. وتی: چیتر. وتم: دەڵێی: خۆزگە لەوەی کەهەم، بەخشندەتر دەبوم.

وتی: بەڵام کوشتنی حسین، یەزید فەرمانی بەمندا کە بیکوژم و گەرنە خۆم دەکوژرام، لەبەر ئەمە من کوژرانی ئەوم هەڵبژارد. بەڵام کۆشکی سپی، لەعەبدالله کوڕی عوسمانی سەقەفیم کڕی و یەزید هەزار هەزار درەمی بۆ ناردم کە ئەوماڵەم پێ کڕی. ئەگەر بمێنم، بۆ بنەماڵەکەم بێت وئەگەر لەناو بچم، داخی بۆ ناخۆم. بەڵام هێنانە سەر کاری دێهاتیەکان بەمشێوە بو: عەبدولرەحمان ئەبی بەکرە و زادان فەروخ لای معاویە خراپەی منیان باس کرد و تەنانەت ئاماژەیان بەچەڵتوکی برنجەکانیش دەدا. ئەم دوانە، باجی عێراقیان بەسەد هەزار هەزار خەملاند. معاویە بۆ دو کار سەرپشکی کردم: دەست لەکارکێشانەوە یا بەڵێندان بۆ پاراستنی دارایی. من دەست لەکارکێشانەوەم پەسەند نەکرد. هەرجار کە عەرەبێکم بۆ کارێك دەست نیشان دەکرد، باجی کەم دەکردەوە و من تاوانەکەیم دەخستە ئەستۆی کەسانی بنەماڵەکەی کە ئەگەر ئەو کارەم دەکرد یا

پاشماوەکەیم لەخۆی داوا دەکرد و دڵی ئەوانم پڕ دەکرد لەکینەی خۆم، ئەگەر وازم لێ دەهێنا، سامانی خوام، بەئاگادار بون لەشوێنەکەی، بەفیرۆ دەدا. من دێهاتیەکانم بۆ کاری باج کۆکردنەوە بەبێ کێشەتر زانی و بینیم کەزیاتر ڕێزی ئەمانەتی دەگرن و بەئاسانی دەتوانم داوای قەرزەکانیان لێ بکەم. لەگەڵ ئەمەیشدا ئێوەم کردە فەرمانڕەوای ئەوان تا نەتوانن ستەم لەهیچ کەسێك بکەن. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەبەخشندەیی ئاماژەت پێدا، سامانێکی ئەوەندەم لەبەردەستا نەبو تا بەخەڵکانی ببەخشم. ئەگەر دەمویست، بەشێك لەدارایی ئێوەم هەڵدەگرت و بەدەستەیەکیترم دەبەخشی و دەستەیەکم بێ بەش دەکرد تا بڵێن: چەندە پیاوێکی بەخشندە و ڕێزدارە. بەڵام ئەوەی کەوتت خۆزگە ئەو کەسانەم نەدەکوشت، بزانە کە دوای باوەڕ هێنان بەتاقانەیی خوا، بەبڕوای خۆم کارێکم نەکردوە کە لەکوشتنی خەواریج، زیاتر من لەخوا نزیك بکاتەوە. ئێستا بەتۆ دەڵێم لەگەڵ خۆمدا باسی چیم دەکرد. بەخۆمم دەوت: خۆزگە شەڕی خەڵکانی بەسرەم دەکرد و ئەوانم کوشتار دەکرد چونکە ئەوان بەخواستی خۆیان و ئازادانە بەیعەتیان لەگەڵ من بەست. ویستم کوشتاریان بکەم بەڵام بەنی زیاد پێیان وتم: ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئەوان بکەیت و بەسەر تۆدا زاڵ ببن، یەك کەس لەئێمە بەزیندویی ناهێڵنەوە. ئەگەر دەستبەرداریان ببیت، هەمومان ناچار دەبین لای خاڵ و زاواکانی خۆمان، خۆمان حەشار بدەین و تۆ بەناچاری بەدەستی ئەوان لەناو دەچیت. من دەموت: خۆزگە زیندانیەکانم دەهێنایەدەر و دەمکوشتن. ئێستا کە بەهیچ کام لەم دو مەبەستەم نەگەیشتوم، خۆزگە کاتێك بگەمە شام کە لەسەر هیچ کارێك ڕێکنەکەوتبێتن.

دەڵێت: ئەو گەیشتە شام و خەڵکان هێشتا لەسەر هیچ کارێك هاودەنگ نەببون (خەلیفەیەکیان هەڵنەبژاردبو) وەك بڵێی ئەوان لەبەردەم ئەو هاوشێوەی منداڵەکان بون. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو ئەوان خەلیفەیان هەڵبژاردبو بەڵام کوڕی زیاد گەیشتە شام و کاروبارەکانی شێواند.

کاتێك لەبەسرەوە بەڕێکەوت، مەسعودی کردە فەرمانڕەوای بەسرە. بەنی تەمیم و خەڵکانی قەیس وتیان: مەسعود پەسەند ناکەین و تەنیا کەسێك بۆ ئەو کارە دەست نیشان دەکەین کە خەڵك پەسندی بکەن. مەسعود وتی: کوڕی زیاد منی بۆ ئەم کارە دەست نیشان کرد و من هیچ کات دەستی لێ هەڵناگرم.

ئەو ڕۆشتەدەر تا گەیشتە کۆشك و ڕۆشتە ناوی. بەنی تەمیم لای ئەحنەف کوڕی قەیس کۆبونەوە و پێیان وت: ئەزدیەکان ڕۆشتونەتە ناو مزگەوت. وتی: مزگەوت هەم بۆ ئێوەیە هەم بۆ ئەوان. وتیان: ڕۆشتنە ناو کۆشك و مەسعود چۆتە سەر تەختی وتاردان. کاتێك کوڕی زیاد بەرەو شام بەڕێکەوت، خەواریج هاتنەدەر و لەکەنارەکانی روباری ئەساوەرە خێوەتیان هەڵدابو. خەڵك گومانیان دەکرد کەسی بۆ لای پیاوی ناو کۆشك رەوانە کردوە و وتویەتی: ئەو دوژمنی ئێمە و ئێوەیە، چ شتێك لەو دورتان دەخاتەوە! دەستەیەك لەوان هاتن و ڕۆشتنە ناو مزگەوت و مەسعود لەسەر تەختیٛ وتاردان بو و بەیعەتی لەگەڵ خەڵکان دەبەست. پیاوێکی مل ئەستوری زۆردار لەخەڵکی پارس بەناو و نیشانی موسلیمی فارسی تیرێکی بۆ هاویشت. ئەو هاتبوە بەسرە و باوەڕی بەئیسلام هێنابو و دواتر پەیوەستی خەواریج ببو. تیرەکە بەردڵی کەوت و ئەوی کوشت. خەڵك وتیان: خەواریج ئەوی کوشت. ئەزدیەکان هێرشیان کردە سەر خەواریج و ئەوانیان کوشتار کرد و لەبەسرە دوریان خستنەوە.

بەخەڵکانی ئەزدیان وت: تەمیمیەکان مەسعودیان کوشت. ئەوان کەسیان رەوانە کرد و پرسیان و بینیان دەستەیەكٛ لەتەمیمیەکان بەو شێوە دەڵێن. لەم کاتەدا ئەزدیەکان کۆبونەوە و زیاد کوڕی عەمرۆ برای مەسعود کوڕی عەمرۆیان کردە سەرکردەی خۆیان و مالك کوڕی میسمەع لەگەڵ خەڵکی رەبیعە هاوڕێیەتی ئەوانیان دەکرد. تەمیمیەکان ڕۆشتنە لای ئەحنەف و وتیان: ئەم خەڵکە بەمەبەستی شەڕ هاتون. ئەو پەلەی نەدەکرد و بۆ ئاژاوە و شەڕ خێرایی لەخۆی نیشان نەدەدا. ژنەکەی ئاگردانێکی هێنا و وتی: لەسەر ئەمە دانیشە. مەبەستی ئەوە بو کە تۆزێك زیاتر نیت.

بەنی تەمیم و هاورێکانیان لەخەڵکانی بەسرە و قەیس بەسەرکردایەتی ئەحنەف کوڕی قەیس هاتنەدەر. هەردولای شەڕکەر روبەروی یەك بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد و کوژراوەکان لەنێوان ئەواندا روی لەزیاد بون کرد. بەنی تەمیم بەوانیان وت: خوا بیر بێننەوە ئەی خەڵکانی ئەزد و لەڕشتنی خوێنی خۆتان و ئێمە خۆتان بەدور بگرن. قورئان لەنێوان ئێمەدا داوەر بێت یا هەرکەس لەموسوڵمانان کە هەڵیبژێرن. ئەگەر بەڵگە و شایەتتان هەیە. باشترین پیاو لەناو ئێمەدا هەڵبژێرن و بیکوژن. ئەگەر بەڵگەتان نیە، سوێند بەخوا دەخۆین کە نەکوشتومانە، نە فەرمانی کوشتنی ئەومان

داوه و نه بکوژەکەی دەناسین. ئەگەر بەمە رازی نابن، خوێنبایی سەرومرەکەتان تا سەد هەزار درەم دەدەین. ئەحنەف ڕۆشتە لای ئەوان و لەوەی رویدابو، داوای لێخۆشبونی کرد. عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر و عەبدولرەحمان کوڕی هشام لەنێوان ئەواندا هاتوچۆیان دەکرد. داوای دە خوێنباییان کرد کەپێی رازی بون و کارەکە بەئاشتی کۆتایی پێهات.

بەڵام عەبدالله کوڕی حارس بەبە، ئەو کاروبارەکانی ئەوانی گرتە دەست و لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند تا عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر وەك فەرماندار لەلایەن کوڕی زیادەوە هاتە بەسرە. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو کوڕی زوبەیر نامەی بۆ عومەر نوسی و ئەوی کردە فەرمانڕەوای بەسرە. نامەکە کاتێك بەدەستی گەیشت، کە دەیوست بۆ حەجی عەمرە بڕوات. عومەر فەرمانی بۆ عوبەیداللەی برای نوسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ خەڵك نوێژ بخوێنێت. ئەو نوێژی لەگەڵ خەڵك خوێند تا عومەر گەڕایەوە. عومەر بۆ ماوەی یەك مانگ فەرمانڕەوا بو تا حارس کوڕی عەبدالله کوڕی ئەبی رەبیعەی مەخزومی فەرمانی لەسەر کار لابردنی ئەوی هێنا. کاروبارەکان بەحارس سپێردرا کە هەمان قوباعە.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدالله کوڕی حارس بەبە دوای کوژرانی مەسعود کوڕی عەمرۆ لەبەر دروست بونی توندوتیژی و فراوان بونی شەڕی خەواریج، دەستی لەکار کێشایەوە. لەبەر ئەمە، خەڵکانی بەسرە نامەیان بۆ کوڕی زوبەیر نوسی. کوڕی زوبەیر نامەی بۆ ئەنس کوڕی مالك نوسی و فەرمانی پێدا پێشنوێژی خەڵك بکات. ئەو بۆ ماوەی چل رۆژ لەگەڵ خەڵك نوێژی خوێند. عەبدالله کوڕی حارس بەبە دەیوت: نامەوێت بەبەهای بەفیڕۆچونی خۆم، چاکسازی لەناو خەڵکدا بکەم. ئەو پیاوێکی دیندار و لەخوا ترس بو. لەرۆژگاری ئەودا بو کە نافع کوڕی ئەزرەق لەبەسرەوە ڕۆشتە ئەهواز.

بەڵام خەڵکانی کوفە، بەهەمان شێوە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا، کاتێك نێردراوەکانی کوڕی زیادیان گەڕاندەوە، جێگرەکەی ئەو یانی عەمرۆ کوڕی حورەیسیان لەسەر کار لابرد. خەڵك کۆبونەوە و وتیان: پیاوێك دەکەینە فەزمانڕەوای خۆمان تا ئەو کاتەی خەڵك خەلیفەیەك هەڵدەبژێرن. ئەوان لەسەر فەرمانڕەوایی عومەر کوڕی سەعد (بکوژەکەی حسین کوڕی عەلی) رێککەوتن. ژنانی هەمەدانیش هاتن و دەستیان بەشین بۆ حسین

کوڕی عەلی کرد و پیاوەکانیان شمشێریان بەست و گەمارۆیان خستە سەر تەختی وتاردان. محەممەد کوڕی ئەشعەس وتی: ئێستا پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو رویداوە. کێندیەکان پشتیوانیان لەعومەر کوڕی سەعد دەکرد چونکە خاڵیان بو. خەڵك لەسەر عامر کوڕی مەسعود کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف کوڕی وەهب کوڕی حوزافەی جومحی رێککەوتن. ئەو لەناو خەڵکی کوفە وتارێکی دا و وتی: هەر خەڵکێك خواردنەوە و خۆشیەکیان هەیە، لەقاپێکدا بەدوایدا بگەرێین کە گومان دەکەن لەو قاپەدا بێت. بەدوای شتێکدا بگەرێن کە بۆ ئێوە شیاو و رەوایە. شەرابەکانی خۆتان تێکەڵ بەئاو بکەن و لەپشت ئەم دیوارانەوە خۆتان لەمن بشارنەوە. کوڕی هومام وتی:

| | |
|---|---|
| اشرب شرابك و انعم غير محسود | و اكسره بالماء لا تعص ابن مسعود |
| ان الامير له فى الخمر ماربة | فاشرب هنيئا مريئا غير مرصود |
| من ذا يحرم ماء المزن خالطه | فى قعر خابية ماء العناقيد |
| انى لا كره تشديد الرواة لنا | فيها و يعجبنى قول ابن مسعود |

یانی: شەرابی خۆت بخۆرەوە و خۆش بە بێ ئەوەی هیچ کەسێك رژدی بەتۆ ببات. تێکەڵ بەئاوی بکە و وتارەکەی کوڕی مەسعود مەخە ژێر پێ. ئەم فەرمانداره لە شەراب خواردن شارەزایە و ئەزمونی هەیە، کەواتە خۆش و بخۆرەوە و نۆشت بێت و بزانە کە هیچ کەس چاودێری تۆ ناکات. کێیە ئەو کەسەی ئاوی شیرینی هەورەکان ناڕەوا بکات بەتایبەت ئەو کاتەی لەقوڵایی گۆزەکان تێکەڵ بەئاوی بۆڵە ترێ دەکرێت. من سەختگیری باوەڕداران سەبارەت بەشەراب پەسەند ناکەم و وتارەکەی کوڕی مەسعود لای من پەسندترە.

کاتێك خەڵکانی کوفە بەیعەتیان لەگەڵ کرد و هەواڵەکەیان بۆ کوڕی زوبەیر نوسی، فەرمانڕەوایی ئەوی لەوێ پشت راست کردەوە. ئەویان بە (گولەی گو خڕکەر) ناوبرد چونکە پیاوێکی کورتە بالاً و چوست و چالاك بو. ئەو تا سێ مانگ دوای مەرگی یەزید کوڕی معاویە مایەوە. دواتر عەبدالله کوڕی یەزیدی خوتەمی ئەنساری کاروباری خەڵکانی کوفەی لەدەست گرت و پێشنوێژی بۆ کردن. ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە، بو بەسەرپەرەستی کاروباری باج. هەر دوکیان لەلایەن کوڕی زوبەیرەوە رەوانە کرابون. ئەو محەممەد کوڕی ئەشعەس کوڕی قەیسی وەك فەرمانڕەوای موسڵ

دەستنیشان کرد. لەسەر ئەم بنەمایە، خەڵکانی بەسرە، کوفە، دانیشتوانی قیبلە لەعەرەبەکان، خەڵکی جەزیرە و خەڵکانی شام (جگە لەئەردەن) هاتنە سنوری فەرمانڕەوایەتی کوڕی زوبەیر. ئەمە هاورۆژگار بو لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر.

لەم کاتەدا تاعونێکی گشتی هێرشی کردە سەر بەسرە. دایکی مرد و کەسی دەست نەکەوت لاشەکەی هەڵبگرێت و بەخاکی بسپێرێت تا ئەوەی چوار باربەریان هێنا و ئەو کارەیان بۆ ئەنجامدا.

## ناسازگاری خەڵکانی ڕەی

لەم ساڵەدا دوای مەرگی یەزید، خەڵکی ڕەی شۆڕشیان کرد. سەرکردەی ئەوان فەرخان رازی بو.، عامر کوڕی مەسعود (فەرمانداری کوفە) محەممەد کوڕی عومەیر کوڕی عوتارد کوڕی حاجب کوڕی زورارەی عودەسی تەمیمی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد. خەڵکی رەی روبەروی بونەوەو شەڕیان دەست پێکرد. محەممەد شکستی خوارد. عامر، عوتاب کوڕی وەرقای ریاحی تەمیمی بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد. شەڕ رویدا و فەرخان کوژرا و بتپەرستەکان شکستیان خوارد. محەممەد کوڕی عەمیر لەشەڕی سەفین سەرکردەی تەمیمیەکانی کوفە بو و شان بەشانی عەلی شەڕی کرد. دواتر ژیانی درێژ بویەوە تا حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی بو بەفەرمانڕەوای کوفە. ئەو لەم شارە هاتەدەر و ڕۆشتە شام چونکە فەرمانڕەوایی حەجاجی پەسەند نەدەکرد.

## بەیعەت لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم

لەم ساڵەدا خەڵك وەك خەلیفە لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم بەیعەتیان کرد.

دوای ئەوەی خەڵك لەگەڵ کوڕی زوبەیر وەك خەلیفە بەیعەتیان کرد، ئەو عوبەیدە کوڕی زوبەیری وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان کرد و عەبدولرەحمان کوڕی جەحدەمی فیهری لەمیسر. مەروان کوڕی حەکەم و ئومەوییەکانی بۆ شام دورخستەوە. عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەم کاتەدا تەمەنی بیست و هەشت ساڵ بو. کاتێك حوصەین کوڕی ئەمیر و هاورێکانی گەیشتنە شام، مەروانی لەگفتوگۆکەی نێوان خۆی و کوڕی زوبەیر ئاگادار کردەوە. بەمەروان و ئومەوییەکانی وت: ئێوە پەرێشان دەبینم،

فەرمانڕەوایەك بۆخۆتان هەڵبژێرن پێش ئەوەی لەسەرزەمینەکەتان هێرشتان بکاتەسەر و ئاژاوەیەکی کەڕ و کوێر بخاتەگەڕ. ئەندێشەی مەروان ئەوە بو بڕواتە لای کوڕی زوبەیر و وەك خەلیفە بەیعەتی لەگەڵ بکات. کوڕی زیاد لەعێراقەوە گەیشت و لەمەبەستەکەی مەروان ئاگادار بویەوە. کوڕی زیاد بەمەروانی وت: من لەم مەبەستەی تۆ شەرم دەکەم. تۆ گەورە و سەرومری قورەیشیت و دەتەوێت بڕۆیتە لای ئەبو خوبەیب و بەیعەتی لەگەڵ بکەیت؟ مەبەستی کوڕی زوبەیر بو چونکە لەروی ناوی کوڕەکەیەوە نازناوی باوکی خوبەیب یان پێ بەخشیبو. مەروان وتی: هێشتا هیچ شتێك نەگۆڕاوە. ئومەوییەکان و کەسەکانیان لەدەوری ئەو کۆبونەوە و خەڵکانی یەمەن پەیوەستیان بون. ئەو بەرەو دیمەشق بەرێکەوت و بەردەوام دەیوت: هێشتا هیچ شتێك نەگۆڕاوە. هاتە دیمەشق و بینی خەڵك لەگەڵ زوحاك کوڕی قەیس بەیعەتیان کردوە لەسەر ئەو بنەمای کە پێشنوێژی ئەوان بێت و کاروبارەکانیان هەڵسوڕێنێت تا خەڵك خەلیفەی داهاتو هەڵبژێرن. ئەو بە نهێنی خەڵکی بۆ فەرمان بردن لەکوڕی زوبەیر هاندەدا.

زەفەر کوڕی حارسی کەلەقێنسرین بۆ کوڕی زوبەیر بەیعەتی وەردەگرت و نەعمان کوڕی بەشیر لەحیمص. حسان کوڕی مالك کوڕی بەجدەلی کەلبی لەفەلەستین، کارگوزاری معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و یەزید کوڕی معاویە بو و فەرمانڕەوایی بۆ ئومەوییەکان دەکرد. ئەو بەرەو ئەردەن بەرێکەوت و ڕوەح کوڕی زێنباعی جوزامی وەك جێگری خۆی دەست نیشان کرد. ناتل کوڕی قەیس دژی ڕوەح ڕاپەڕی و ئەوی لەفەلەستین دەرکرد وبۆ کوڕی زوبەیر بەیعەتی وەرگرت.

حسان لەئەردەن خەڵکی بۆ فەرمانبەری ئومەوییەکان هاندەدا. ئەو بەخەڵکانی ئەردەنی وت: سەبارەت بەکوڕی زوبەیر و کوژراوەکانی حورە چۆن دەتانەوێت شایەتی بدەن؟ وتیان: شایەتی دەدەین کە ئەوپیاوێکی دورو و ریاکارە و کوژراوانی حورە دەڕۆنە جەهەننەم. پرسی: سەبارەت بەیەزید و کوژراوەکان لەحورە چۆن شایەتی دەدەن؟ وتیان: شایەتی دەدەین کە ئەو لەسەر ڕاستی و دروستی بو و ئەوان بەرەو بەهەشت دەڕۆن. وتی: منیش شایەتی دەدەم کە ئەگەر یەزید و شوێنکەوتەکانی لەسەر ڕاستی و دروستی بون، ئەمڕۆیش بەهەمان شێوە لەسەر ئەو ڕێگان و ئەگەر کوڕی زوبەیر و شوێنەکەوتەکانی ڕێگەی چەوتی و ناڕاستیان گرتبوەبەر، ئەمڕۆ بەهەمان شێوە لەسەر

ئەو ڕێگان. وتیان: ڕاستت وت، لەگەڵ تۆ بەیعەت دەکەین تا دژی نەیارەکانی تۆ شەڕ بکەین و ڕوبەڕوی شوێنکەوتەکانی کوڕی زوبەیر ببینەوە لەسەر ئەو بنەمای کەئێمە لەم دوکوڕە (عەبدالله کوڕی یەزید و خالید کوڕی یەزید) بەدور بگریت چونکە دەترسین پیرەپیاوێك بکەنە فەرمانڕەوای ئێمە و ئێمە منداڵێك بەوان پێشنیار بکەین.

حسان دو نامەی نوسی: یەکیان بۆ زوحاك کوڕی قەیس کە تیایدا ئاماژەی بەماف ئومەوییەکان و ئەزمونی ئەوان دەکرد و سەرکۆنەی کوڕی زوبەیری دەکرد وبیری دەخستەوە کە کوڕی زوبەیر دو خەلیفەی لەسەر کار لابردوە. فەرمانی پێدا نامەکەی بۆ خەڵك بخوێنێتەوە. نامەیەکیتری نوسی و بەنێردراوەکەی خۆی (باغیزە)ی سپارد و پێی وت: ئەگەر نامەکەی منی بۆخەڵك خوێندەوە، چ باشتر و گەرنە ئەم نامەیان بۆ بخوێنەرەوە. حسان نامەی بۆ بەنی ئومەییە نوسی و فەرمانی پێدان لەو کاتەدا کۆببنەوە. باغیزە هات و نامەکەی زوحاکی تەسلیم کرد و نامەی ئومەوییەکانی گەیاندە دەستیان. کاتێك ڕۆژی هەینی گەیشت، زوحام ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و باغیزە پێی وت نامەکەی حسان بۆ خەڵك بخوێنێتەوە. زوحاك پێی وت: دانیشە. ئەو دو یا سێ جار هەستا و زوحاك پێ دەوت: دانیشە. باغیزە نامەکەی دەرهێنا وبۆ خەڵکی خوێندەوە. وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی سوفیان وتی: حسان ڕاستی وتوە و کوڕی زوبەیر درۆ دەکات. ئەو جوێنی بەکوڕی زوبەیردا.

دەستەیەك دەڵێن: وەلید کوڕی عوتبە دوای مەرگی معاویە کوڕی یەزید مرد و یەزید کوڕی ئەبی غەمسی غەسانی و سوفیان کوڕی ئەبرەدی کەلبی هەستان و جوێنیان بە کوڕی زوبەیردا و حسانیان بەڕاستگۆ زانی. عەمرۆ کوڕی یەزیدی حەکەمی هەستا و جوێنی بەحساندا و وەسفی کوڕی زوبەیری کرد. زوحاك فەرمانیدا کە وەلید کوڕی عوتبە و یەزید کوڕی ئەبی غەمس و سوفیان کوڕی ئەبرەدیان خستە زیندانەوە. خەڵکان ڕاپەڕین و کەوتنە جموجۆڵ و خەڵکی کەلب هێرشیان کردە سەر عەمرۆ کوڕی یەزیدی حەکەمی و لێیاندا وجلەکانیان دڕاند. خالید کوڕی یەزید هەستا و ڕۆشتە سەر دوەم پلە لەتەختی وتاردن و خەڵکی ئارام کردەوە. زوحاك هاتەخوار و نوێژی هەینی خوێند و بۆ کۆشك گەڕایەوە. خەڵکی کەلب هاتن و سوفیانیان دورخستەوە و خەڵکی غەسان هاتن و یەزیدیان دور خستەوە. خالید کوڕی یەزید و براکەی عەبدالله کوڕی

یەزید کوڕی معاویە هاوڕێ لەگەڵ خاڵۆکانی خۆیان لەخەڵکی کەلب هاتن و وەلید کوڕی عوتبەیان دورخستەوە. خەڵکانی شام ئەو ڕۆژە بەیەکەم ڕۆژی جەیرون ناودەبەن.

دواتر زوحاك کوڕی قەیس ڕۆشتە مزگەوت و یەزید کوڕی معاویەی بیر هێنایەوە و جوێنی پێدا. گەنجێك لەخەڵکانی کەلب هەستا و لێیدا. خەڵك پەلاماری یەکیاندا و ئاژاوەیان دەست پێکرد. خەڵکانی قەیس خەڵکی بۆ فەرمانبەری لە کوڕی زوبەیر هاندەدا و هاوڕێکانی زوحاك و خەڵکی کەلب بۆ فەرمانبەری لەئومەوییەکان. ئەوان باسی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویەیان دەکرد چونکە خوشکەزای ئەوان بو.

زوحاك ڕۆشتە کۆشکی فەرمانداری و لەبەیانی ئەو ڕۆژەوە بۆ نوێژی بەیانی نەهاتەدەر. ئەو کەسی بۆ لای ئومەوییەکان ڕەوانە کرد و داوای بەخشینی کرد و ئاماژەی بەوەدا کە مەبەستی ڕەنجاندنی بەنی ئومەییە نیە. فەرمانی بەواندا نامە بۆ حسان بنوسن و ئەو هاوڕێ لەگەڵ ئەوان بنوسێت تا لەئەردەنەوە بێتە جابیە و ئەمان لەدیمەشقەوە بڕۆن جابیە ولەوێ کۆببنەوە و بەیعەت لەگەڵ پیاوێك لەئومەوییەکان بکەن. ئەوان بەپێشنیارەکەی ڕازی بون و ڕەزامەندیان نیشاندا و نامەیان بۆ حسان نوسی. زوحاك و ئومەوییەکان بەرەو جابیە بەڕێکەوتن. سەوەر کوڕی مەعنی سولەمی ڕۆشتە لای زوحاك و وتی: داوات لێکردین فەرمانبەری لەکوڕی زوبەیر بکەین و ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە بەیعەتمان لەگەڵ تۆکرد و ئێستا تۆ پەنا بۆ ئەو بیابان نشینە عەرەبە لەخەڵکی کەلب دەبەیت تا خوشکەزاکەی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە وەك خەلیفە دەستنیشان بکەیت. زوحاك پرسی: بۆچونی ڕاست چیە؟ وتی: دەبێت ئەوەی بەنهێنی دەمانهێشتەوە، ئاشکرای بکەیت و خەڵك بۆ فەرمانبەری لەکوڕی زوبەیر هان بدەیت.

زوحاك و خەڵکەکەی هاوڕێی گەڕانەوە و لەمەرج ڕاهیت دابەزین و دیمەشق لەدەستی زوحاکدا بو. ئومەوییەکان و حسان و کەسانیتر لەجابیە کۆبونەوە. حسان بۆ ماوەی چل ڕۆژ نوێژی لەگەڵ خەڵك خوێند و ئەوان ڕاوێژیان دەکرد. مالك کوڕی هوبەیرەی سەکونی خوازیاری خالید کوڕی یەزید و حوصەین کوڕی نەمیر خوازیاری مەروان. مالك بەحوصەینی وت: باشترە لەگەڵ ئەم کوڕە بەیعەت بکەین کە باوکی ئێمە پەروەردەمان کرد و تۆ پێگەی ئێمە لای باوکی دەزانیت. ئەو ئێمە دەکاتە فەرمانڕەوای عەرەبەکان. حوصەین وتی: سوێند بەخوا هیچ کات بەوە ڕازی نابم عەرەبەکان پێشنیاری پیرێکی

فرەزانمان پێ بکەن و ئێمە پێشنیاری منالێك بەوان بدەین. مالك پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر مەروان بێنیتە سەر کار، پیاوێکی بەرچاوتەنگ و ڕەشبین دەبینی کە بۆ قامچی، قەیتانی پێلاو و سێبەری ئەو دارەی لەژێریدا دەحەوێیتەوە، رژدیت پێدەبات. مەروان هەم باوکی بنەماڵەیەکی گەورەیە و هەم برای بنەماڵەیەکی گەورە. ئەگەر بەیعەتی لەگەڵ بکەن، دەبنە کۆیلەی ئەوان. دەبێت خوشکەزاکەی بێننە سەر کار. حوصەین وتی: لەخەودا بینیم چرادانێك (چل چرا) لەئاسمانەوە هەڵواسراوە و هەرکەس بەخەلافەت بگات، هەڵیدەگرێت. تەنیا مەروان بو بەدەستی هێنا. سوێند بەخوا بێ گومان بەیعەتی لەگەڵ دەکەم.

روح کوڕی زێنباعی جوزامی وتی: ئێوە عەبدالله کوڕی عومەر و هاوڕێیەتی ئەو لەگەڵ پێغەمبەر و پێشینەی ئەو لەئیسلامدا بەباشی دەزانن. ئەو هەمان کەسە کە خۆتان ئاماژەی پێدەدەن بەلاّم پیاوێکی لاوازە و پیاوی لاواز ناتوانێت فەرمانڕەوایی ئۆمەتی محەممەد بکات. ئێوە کوڕی زوبەیر دەناسن و بەهەمان شێوەیە کە دەزانن. کوڕی هاوڕێی تایبەتی پێغەمبەر و زادەی ئەسمای (دو پشتێن)ە. بەلاّم بەهەمان شێوە کەمئاگادارن، پیاوێکی دوروو و ریاکارە کە گەردنبەندی خەلافەتی لەملی دو خەلیفە( یەزید و کوڕەکەی معاویە کوڕی یەزید) داکەند، خوێنەکانی رژاند و کەلێنی لەناو یەکریزی موسوڵمانان دروست کرد. کەسێکی دورو هیچ کات ناتوانێت فەرمانڕەوای ئۆمەتی محەممەد بێت. بەلاّم مەروان کوڕی حەکەم، سوێند بەخوا هیچ کەلێن و درزێك لەئیسلامْ دروست نەدەبو، مەگەر ئەوەی بەچاککردنەوەی هەڵدەستا. ئەو هەمان کەسە لەشەڕی وشتر لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب شەڕی ئەزمون کرد. من بەباشی دەزانم خەڵك گەورە بێننە سەرکار و بچوك بکەنە راوێژکاری. مەبەستی لەگەورە مەروان و مەبەستی لەبچوك خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بو.

بۆچونی ئەوان بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم و دواتر لەگەڵ خالید کوڕی یەزید و دواتر عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس یەکیگرت لەسەر ئەو بنەمای کە فەرمانڕەوایی دیمەشق بۆ عەمرۆ کوڕی سەعید و فەرمانداری حمص بۆ خالید کوڕی یەزید بێت.

حسان، خالید کوڕی یەزیدی بانگ کرد وپێی وت: کوڕی خوشکەکەم، خەڵك لەبەیعەت

لەگەڵ تۆ (بەهۆی کەم تەمەنی) خۆیان بەدور گرت. سوێند بەخوا من ئەم کارەم تەنیا بۆ تۆ و بنەماڵەکەی تۆ دەوێت و تەنیا لەبەر ئێوە لەگەڵ مەروان بەیعەت دەکەم. خالید وتی: بەوشێوە نیە، بەڵکو لەکارەکەی ئێمەدا ناتەوان بویت. وتی: سوێند بەخوا ناتەوان نەبوم، بەڵکو ئەوە بۆچونی خەڵك بو.

ئەوان سێ ڕۆژی یەکەمی مانگی زیقەعدەی ساڵی ٦٤/ ٢٢ ژوئەنی ٦٨٤ زایینی لەگەڵ مەروان بەیعەتیان بەست. کاتێك لەگەڵ مەروان بەیعەتیان بەست، بەمشێوەی وت:

| | |
|---|---|
| لما رايت الامر انرا نهبا | يسرت غسان لهم و كلبا |
| و السكسكيين رجالا غلبا | و طيئا تاباه الا ضربا |
| و القين تمشى فى الحديد نكبا | و من تنوخ مشمخرا صعبا |
| لا ياخذون الملك الا غصبا | فان دنت قيس فقل لاقربا |

یانی: کاتێك کاروباری فەرمانڕەوایی کردن بەسەر عەرەبەکانم لەبناغەوە لەسەر بنەمای تالاَن و تالاَنکاری بینی، بۆ ئەوان خەڵکی غەسان و هۆزی کەلبم هاندا. سەکسەکیەکانم بۆ کار ناچار کرد کە پیاوانێکی بەهێز و ئازان. خەڵکانی تەی کە تەنیا بەلێدان تەسلیم دەبن. کۆیلە بەشێوەیەکی ریسوایانە، لەبەندی ئاسنین تەقەلا دەکات و لەتەنوخ پیاوێکی بالاَبەرز و توندوتیژد. ئەوان تەنیا بەزۆر پاشایەتی بەدەست دێنن. ئەگەر قەیسیەکان هاتن، پێیان بڵێ، ئاگادار بن، نزیك مەبنەوە.

## شەڕی مەرج راهیت

## کوژرانی زوحاك و نەعمان کوڕی بەشیر

کاتێك خەڵك لەگەڵ مەروان بەیعەتیان کرد، لەجابیەوە ڕۆشتە مەرج راهیت کە زوحاك کوڕی قەیس هاورێ لەگەڵ هەزار سوار لەوێ بو و هاوکاری لەنەعمان کوڕی بەشیر وەرگرتبو تا گەمارۆ بخاتە سەر حمص. ئەو شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاعی بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد. هەروەها لەزوفەر کوڕی حارس فەرمانداری قێنسرین داوای هاوکاری کرد کە خەڵکی ئەم شارەی بۆ هاوکاری کردنی ئەو رەوانە کرد. ناتل خەڵکی فەلەستینی بۆ هاوکاری ئەو ردوانە کرد. ئەوان لای ئەو کۆبونەوە. لای مەروان ئەم خەڵکانە کۆبونەوە: کەلب، غەسان، سەکاسك و سەکون. ئەو عەمرۆ کوڕی سەعیدی کردە

فەرماندەی باڵی راستی خۆی و عوبەیدالله کوڕی زیادی کردە فەرماندەی باڵی چەپ. یەزید کوڕی ئەبی غەمس لەدیمەشق خۆی شاردبویەوە و لەبەر ئەمە لەکۆبونەوەکانی جابیە بەشداری نەکرد. ئەو دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت وبۆ مەروان بەیعەتی وەرگرت و خەڵکان و کەل وپەلی شەڕی خستە بەردەست. ئەمە یەکەم سەرکەوتنی ئومەوییەکان بو.

لەنێوان مەروان و زوحاك لەمەرج راهیت شەڕ رویدا و بۆ ماوەی بیست شەو شەڕیان کرد و شەڕیان بەرەو دژواری برد. زوحاك کوڕی قەیس کوژرا. دەحیە کوڕی عەبدالله ئەوی کوشت. هاورێ لەگەڵ ئەو هەشتا پیاو لەگەورەکانی شام کوژران. شامیەکان بەشێوەیەکی قورس کوشتار کران و قەیسیەکان بەشێوەیەك کوشتار کران کە هیچ کات کوشتاری لەو شێوەیان نەبینیبو. لەناو کوژراوەکان، یەکیان هانی کوڕی قەبیصەی ئەمیری بو کە سەروەری خەڵکەکەی خۆی و هاورێی زوحاك بو. وازع کوڕی زوالەی کەلبی ئەوی کوشت. کاتێك بریندار بو و کەوتە سەر زەوی، وتی:

| | |
|---|---|
| تعست ابن ذات النوف اجهز على فتى | يرى الموت خيرا من فرار و الزما |
| و لا تتركني بالحشاشة انني | صبور اذا ما النكس مثلك احجما |

یانی: ئەی کوڕی ژنی داوێن پۆش، وەرە و پیاوێکی بریندار بکوژە کە مەرگ بەشیاوتر و چاکتر لەهەلاتن دەزانێت. من لەنێوان ژیان و مەرگ مەهێڵەرەوە چونکە خۆڕاگرم و ئەمە لەکاتێکدایە کەسێکی پەستی وەك تۆ لەترسا دەست لەشەڕ هەڵبگرێت.

وازع گەڕایەوە و ئەوی کوشت.

ئەم شەڕە لەموحەڕەمی ساڵی ٦٥/ ئوتی ٦٨٤ زایینی یا لەکۆتایی ساڵی ٦٤/ ژوئیەی ٦٨٤ زایینی رویدا.

مەروان سەری زوحاکی بینی و وتی: ئێستا کەژیانی من درێژ بۆتەوە و ئێسکەکانم ناسك بونەتەوە و بەئەندازەی تینویەتی کەرێك رۆژگار لەبەردەممدا مایەوە، بەدەستە شەڕکەرەکان هاتم و خەڵکانم خستە گیانی یەك.

کاتێك خەڵك لەمەرج راهیت شکەستیان خوارد، پەیوەستی سوپاکانی خۆیان بون. خەڵکی حمص رویان لەو شارە کرد کە فەرماندارەکەی نەعمان کوڕی بەشیر بو. کاتێك ئەم هەواڵەی بیست، شەوانە هاورێ لەگەڵ هاوسەرەکەی نایلە کچی عەمارەی کەلبی و

منداڵەکانی باروبنەی خۆی هەڵگرت و رایکرد و سەراسەری شەوی بەسەرگەردانی بەسەر برد. خەڵکی حمص لەکاتی بەرەبەیان، بەدوایدا گەڕان. ئەو کەسەی شوێنی کەوت عەمرۆ کوڕی جەلی کەلابی بو کە ئەوی گرت و کوشتی و بنەماڵەکەی گەڕاندەوە. کەلبیەکانی حمص هاتن و ژنەکەی نایلە و ماڵ و منداڵەکەیان بۆ شوێنێکی ئارام و ئاسودە گواستەوە.

کاتێك هەواڵی شکستی قێنسرین بەزەفەر کوڕی حارسی کەلابی گەیشت، لەوێ رایکرد و روی کردە قرقیسیا کە فەرماندارەکەی عەیازی حەرەشی بو. یەزید ئەوی لەوێ دەستنیشان کردبو. داوای لێکرد رێگەی بدات بڕواتە ناو گەرماو. سوێند بەئازاد کردنی ژنەکەی خۆی و ئازاد کردنی کۆیلەکانی خۆی (تەلاق و عتاق) دەخوارد کە کاتێك لەگەرماو بێتەدەر، لەم شارەدا نەمێنێت. رۆشتە ناوی و بەسەریدا زاڵبو و لەقەلاکەیدا خۆی حەشاردا و نەڕۆشتە ناو گەرماوەکەی. خەڵکانی قەیس لەدەوری کۆبونەوە.

ناتل کوڕی قەیسی جوزامی لەفەلەستین رایکرد و لەمەککە پەیوەستی کوڕی زوبەیر بو. مەروان دوای ئەو روح کوڕی زێنباعی کردە فەرمانڕەوای فەلەستین. شام بۆ مەروان رام و دەستەمۆ بو و ئەو کارگوزارانی خۆی رەوانەی ناوچەکانی شام کرد.

دەڵێن: کوڕی زیاد کاتێك رۆیشتە لای ئومەوییەکان کە ئەوان لەتەدمور بون و مەروان دەیویست بڕواتە لای کوڕی زوبەیر و بەیعەتی لەگەڵ بکات و ئەمان بۆ ئومەوییەکان وەربگرێت. کوڕی زیاد رێگەی ئەم کارەی لێگرت و فەرمانی پێدا هاورێ لەگەڵ خەڵکانی تەدمور هێرش بکاتە سەر زوحاك کوڕی قەیس و شەڕ لەگەڵ ئەو دەست پێبکات. عەمرۆ کوڕی سەعید بۆچونەکەی پشت راست کردەوە و رێنوێنی مەروانی کرد تا دایکی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە وەك هاوسەر هەڵبژێرێت تا خالید لەبەرچاوی خەڵك ریسوا ببێت. ئەوی کردە هاوسەری خۆی. ئەو فاختە کچی ئەبوهاشم کوڕی عوتبە بو. دواتر ئومەوییەکانی کۆکردەوە کە بەیعەتیان لەگەڵ بەست و دواتر خەڵکانی تەدمور دەستی بەیعەتیان بۆ ئەو درێژ کرد. ئەو بەسوپایەکی گەورە روی لەشەڕی زوحاك کرد. زوحاك روبەروی بویەوە و هەردولا شەڕیان ئەزمون کرد کە دواهاتەکەی، زوحاك و هاورێکانیان شکەستیان خوارد و زوحاك کوڕی قەیس کوژرا.

زەفەر کوڕی حارس بەرەو قرقیسیا بەرێکەوت و قورەیشیەکان دەوریان گرت. لەکاتی

هەڵاتن بەرەو قرقیسیا دو گەنج لەبەنی سولەیەم هاورێیەتیان دەکرد. سوارەکانی مەروان هاتن و بەدوای زەفەردا گەڕان. دو گەنجەکە بەزەفەریان وت: خۆت رزگار بکە چونکە ئێمە دەکوژرێین. زەفەر ئەو دوانەی بەجێهێشت و هەڵات. ئەو دوانە کوژران و زەفەر لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| اربنی سلاحی لا ابا لك اننی | اری الحرب لا تزداد الا تمادیا |
| اتانی عن مروان بالغیب انه | مقید دمی او قاطع من لسانیا |
| ففی العیس منجاة و فی الارض مهرب | اذا نحن رفعنا لهن المثانیا |
| فلا تحسبونی ان تغیبت غافلا | و لا تفرحوا ان جئتکم بلقائیا |
| فقد ینبت المرعی علی دمن الثری | له ورق من تحته الشر بادیا |
| و نمضی و لا یبقی علی دمنة | و تبقی حزازات النفوس کما هیا |
| لعمری لقد ابقت وقیعة راهط | لحسان صدعا بیننا متنائیا |
| فلم ترمنی نبوة قبل هذه | فراری و ترکی صاحبی ورائیا |
| عشیة ادعو فی القران فلا اری | من الناس الا من علی و لا لیا |
| اینهب یوم واحد ان اسائة | بصالح ایامی و حسن بلائیا |
| فلا صلح حتی تنحط الخیل بالقنا | و تثار من نسوان کلب نسائیا |
| الا لیت شعری هل تصیبن غارتی | تنوخا و حیی طیء من شفائیا |

یانی: ها ئەی بێ باوك، کەرەستەکانی شەڕی خۆم نیشان بدە کە دەبینم شەڕ تەنیا بە فراوان بون و مانەوە کۆتایی دێت. بەنهێنی هەواڵی مەروانیان بۆ هێنام کە لەتۆڵەدا دەمکوژێت یا زمانم دەبڕێت. بەوشترە سپی خۆڵەمێشی باوەکان، دەتوانرێت رزگارمان بێت و زەوی خوا باشترین شوێنی هەڵاتنە. کاتێك تەنافە مووینەکان بۆ ئەوان بەرز بکەینەوە. ئەگەر خۆم داشارد، بەنائاگام مەزانن و ئەگەر هاتم وچاوم بەئێوە کەوت، شادان مەبن. هەندێ کات رودەدات گیایەك لەسەر پشکلێکی سەر زەوی دەروێت یا لەپاشماوەی خێوەتەکەی یار سەر هەڵدەدات بەلام گەلایەکی لێ دەروێت کە زیان لەشۆڕبونەوەی ئاشکرایە. ئێمە دەڕۆین و هیچ نیشانێك لەکۆچکەران لەسەر زەوی نامێنێتەوە بەلام کینەی دڵەکان خۆڕاگر و بەهێز دەمێننەوە. سوێند بەگیانی خۆم، شەڕی دژواری مەرج راهیت کەلێنێکی ئەوەندە گەورەی دروست کرد کە لێوارەکانی رۆژ

لەدوای رۆژ لەیەك دوردەكەونەوە. پێش من كەسێكی بەرزەفڕی لەو شێوە نەبینراوە. كەس بیری ناكەوێتەوە كە من رامكردبێت و دو هاوڕێی گیانی بەگیانی خۆم بە جێهێشتبێت. ئەو ئێوارێی كە لەناو شەڕكەران هاوارم دەكرد و هەر كەسێكم دەدی لەگەڵ من بو، نەك دژی من. ئایا ئەگەر تەنیا یەك رۆژ خراپەم كردبێت (یا یەك رۆژم خراپ كردبێت) دەبێت هەمو نیشانەكانی رۆژە باشەكانی من بسڕێتەوە. هیچ ئاشتیەك لەئارادا نیە تا ئەسپەكان لەبەركەوتنی تیر و ڕمەكان هاوار بكەن و ژنانی ئێمە كینەی ژنانی كەلب لەدڵ بگرن. خۆزگە دەمزانی ئایا هێرشەكانی من دەگاتە تەنوخ و دادی دڵ لەدو هۆزی تەی وەردەگرم یا نە.

جەواس كوڕی قەعتەل لەوەڵامدا وتی:

| | |
|---|---|
| لعمری لقد ابقت وقیعة راهط | علی زفر مرا من الداء باقیا |
| مقیما ثوی بین الضلوع محله | و بین الحشا اعیا الطبیب المداویا |
| تبكی علی قتلی سلیم و عامر | و ذبیان معذورا و تبكی البواكیا |
| دعا بالسلاح ثم احجم اذ رای | اذا شرعوا نحو الطعان العوالیا |

یانی: سوێند بەگیانی خۆم كە شەڕی مەرج راهیت ئازارێكی تاڵ و گیانبڕی بۆ زەفەر كوڕی حارس بەجێهێشت كە هەمیشە دەمێنێتەوە. ئازارێكی درەنگوەخت كە شوێنەكەی لەناو پەراسوەكانە و بەشێوەیەك لەجەستە جەقیوە كە پزیشكی تیماركەری بێزار كردوە. بۆ كوژراوەكانی عامر و سولەیم بگری و زوبیانیەكان وەك ئەو كەسانەی داوای بەخشین دەكەن، بێنەبەرچاو كە دەبێت ژنانی شین گێر بۆیان بگرین. داوای كەڵ وپەلی شەڕی كرد و پۆشی و دواتر دەستی لەشەڕ هەڵگرت چونكە شمشێرە ئاودارەكانی بینی و گەنجەكانی سوار لەسەر ئەسپە رەسەنەكان. لەسەر ئەوان گەنجانێكی بەهێز هاوشێوەی شێرەكانی دارستان بون كە بە پەلە شەڕیان بەرمە بەرز و دەركێشراوەكان دەست پێكرد.

عەمرۆ كوڕی جەلی كەلبی وتی:

| | |
|---|---|
| بكی زفر القیسی من هلك قومه | بعبرة عین ما یجف سجومها |
| یبكی علی قتلی اصیبت براهط | تجاوبة هام القفار و بومها |

| | |
|---|---|
| ابحنا حمی للحی قیس براهط | و ولت شلا لا و استبیح حریمها |
| یبکیهم حران تجری دموعه | یرجی نزارا ان تووب حلومها |
| فمت کمدا اوعش ذلیلا مهضما | بحسرة نفس لا تنام همومها |

یانی: زەفەری قەیسی بۆ لەناوچونی خەڵکەکەی دەستی بەگریان کرد و ئەوەندە فرمێسکی باراند کە مژۆڵەکانی نەیانتوانی وشك ببنەوە و پێڵوەکانی نەیانتوانی بەیەك بگەن. بۆ کوژراوەکانی مەرج راهیت دەگریت کە جەستەیان لەناو خاك و خوێندا کەوتوە و لاشخۆر و کەمتیارەکان هاتوچۆیان دەکەن. لەخەڵکانی قەیس پێگەیەکمان بەفیڕۆدا کە ژیان دیتو هەڵات چونکە شوێنەکەیان ئارامی تیا نەما و بەفیڕۆچو. داغدار بەردەوام بۆ ئەوان دەگریت و هیواداره ئارمانەکانیان دوباره زیندو ببێتەوە و ببنە راستی. لەخەمی ئەوەدا بمرە یا بەریسوایی ژیان بەسەر ببە، بەداخێکی دەرونی کەهیچ کاتێك بەئارامی و ئاسایش ناگەن.

ئەم قەسیدە چەندین بەیتی دورودرێژە.

## دەست بەسەرداگرتنی میسر لەلایەن مەروانەوە

کاتێك زوحاك و هاوەڵانی کوژران و شام بۆ کوڕی حەکەم دەستەمۆ بو، روی لەمیسر کرد. گەیشتە ئەویٚ و فەرماندارەکەی عەبدولرەحمان کوڕی جەحدەمی قورەشی بو کە خەڵکی بۆ فەرمانبەری کوڕی زوبەیر هان دەدا. ئەو و هاوڕێکانی بۆ شەڕی مەروان هاتنەدەر. مەروان عەمرۆ کوڕی سەعیدی بۆ پشت سەری ئەو رەوانە کرد کە ڕۆشتە ناو میسر. ئەم هەواڵەیان بە کوڕی جەحدەم گەیاند. ئەو گەڕایەوە و خەڵك لەگەڵ مەروان بەیعەتیان کرد و مەروان بۆ دیمەشق گەڕایەوە. کاتێك لەو شارە نزیك کەوتەوە، بیستی کە کوڕی زوبەیر براکەی مەصعەبی هاوڕێ لەگەڵ سوپایەك بۆ ئەو دیارە رەوانە کردوە. مەروان پێش ئەوەی ئەو بگاتە شام، عەمرۆ کوڕی سەعیدی بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە کرد. مەصعەب و هاوڕێکانی شکەستیان خوارد. مەصعەب پیاوێکی بوێر بو. دواتر مەروان هاتە ناو دیمەشق و تیایدا ئارامی گرت.

حوصەین کوڕی نەمیر و مالك کوڕی هوبەیرە لەبەرژەوەندی خۆیان و خالید کوڕی یەزید چەندین مەرجیان خستبوە ئەستۆی مەروان. کاتێك پاشایەتیەکەی بەهێزبو، رۆژێك کە مالك لای ئەو دانیشتبو، وتی: هەندێ کەس داوای مەرجەکانیان دەکەن.

یەکێك لەوان ئەوەیە بۆنێکی خۆش بەسەروروی خۆیدا بپرژێنێت و کل لەچاوەکانی بکات. مەبەستی مالك بو کەئەو کارەی دەکرد. مالك وەلآمی دایەوە: ئەمە دەلێیت و هێشتا نەگەشتویتە تەهامە. ئەمە کاتێك دەهێنیتە سەرزمان کە پشتێن لەگۆی مەمك توند بوە. مەروان وتی: ئەی باوکی سەلمان، ئارام بە، گالتەم لەگەلّ کردیت.

## بەیعەتی خوراسانیەکان لەگەلّ سەلم کوڕی زیاد

بەسەرهاتی عەبدالله کوڕی خازم

کاتێك هەوالّی مەرگی یەزید لەخوراسان بەسەلم کوڕی زیاد گەیشت، هەوالّەکەی شاردەوە. لەم کاتەدا کوڕی عەرادە وتی:

| | |
|---|---|
| یا ایها الملك المغلق بابه | حدثت امور شانهن عظیم |
| قتلی بحرة و الذین بکابل | و یزید اعلن شانه المکتوم |
| ابنی امیة ان اخر ملککم | جسد بحخوارین ثم مقیم |
| طرقت منیته و عند و ساده | کوب و زق راعف مرثوم |
| و مرنة تبکی علی نشوانه | بالصبح تقعد مرة و تقوم |

یانی: ئای ئەو پاشایەی دەرگاکانت بەسەر خۆت و بێگانەدا بەستوە، پێشهاتەکان رویانداوە کە دەبێت بەهایەکی زۆری بۆ بدەیت. کوژراوانێك لەحورەن و کەسانێتر لەکابول و یەزید کوڕی معاویە، نهێنیەکەی ئاشکرا بو. مەرگ لەکاتی شەودا هێرشی کردەسەر و لەو کاتەدا لای سەرین وتاولە و مەشکەیەکی پڕ بادە بو کە شەرابی لێ دەهاتەدەر و بۆنە خۆشەکەی هەر بۆنکەرێکی مەست دەکرد. زۆرن ئەو ژنە شین گێڕانەی درێغیان بۆ مەستی ئەو دەخوارد و فرمێکسیان دەرژاند و بەرەبەیانی زو لەخەو هەلّدەستا و دادەنیشت.

کاتێك ئەم هۆنراوەکەی خۆی ئاشکرا کرد، سەلم مردنی یەزید کوڕی معاویە و کوڕەکەی معاویە کوڕی یەزیدی راگەیاند و خەلّکی بۆ بەیعەت و فەرمانبەری هاندا تا ئەو کاتەی خەلیفە دەستنیشان دەکرێت و کاروبارەکان سامان دەگرێت. ئەوان بەیعەتیان لەگەلّ کرد و دوای دو مانگ پەیمانەکەی خۆیان خستە ژێرپێ. ئەو پیاوێکی چاکەکار بو و خەلّکان خۆشیان دەویست. کاتێك لەسەر کار لابرا، موهەلیب کوڕی ئەبی صوفرەی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. کاتێك لەسەرەخس بو، سلێمان کوڕی مورسد (پیاوێك لەبەنی

قەیس کوڕی سەعلەبە) چاوی پێیکەوت کە پێی وت: نەزارییەکان جێگەیان بەتۆ تەنگ کرد تا پیاوێکت لەخەڵکانی یەمەن کردە فەرمانڕەوای ئەوان؟ (مەبەستی موهەلیب بو). ئەو ئەزدی بو و ئەزدییەکان خەڵکانی یەمەن. لای مەروروود و فاریاب و تالەقان و جوزجان تێپەڕی کرد و ئەوس کوڕی سەعلەبە کوڕی زەفەری (خواوەندی کۆشکی ئەوس لەبەسرە) وەك فەرمانداری هەرات دەستنیشان کرد. کاتێك گەیشتە نەیشابور، عەبداللە کوڕی خازمی بینی و پرسی: کاری خوراسانت بەکێ سپارد؟ ئاگاداری کردەوە. وتی: خوراسانت لەنێوان بەکر و وایل دابەش کرد، ئایا لەم شارەدا کەست دەست نەکەوت بیکەیتە فەرمانڕەوا؟ فەرمانی فەرمانداری خوراسان بۆ من بنوسە. فەرمانەکەی بۆ نوسی و سەد هەزار درەمی پێدا.

کوڕی خازم بەرەو مەرو بەڕێکەوت. موهەلیبان لەم کارە ئاگادار کردەوە و ئەو پیاوێك لەبەنی جوشەم کوڕی سەعد کوڕی زەید مەنات کوڕی تەمیمی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. کاتێك کوڕی خازم گەیشتە مەرو، پیاوی جوشەمی ڕێگەی چونە ناو شاری لێگرت و لەنێوان ئەوان بگرە و بێنە دروست بو. بەکێك بەردی گرتە ناوچاوی پیاوی جوشەمی و ئەم دوانە لەیەك جیابونەوە و کوڕی خازم ڕۆشتە ناو شارەکە و جوشەمی دو ڕۆژ دوای ئەوە مرد.

دواتر کوڕی خازم بەرەو لای سلێمان کوڕی مورسەد لەمەروروود بەڕێکەوت. چەندین ڕۆژ شەڕی لەگەڵ کرد و سلێمان کوژرا. دواتر بەرەو لای عەمرۆ کوڕی مورسەد ڕەوانە بو کە لەتالەقان بو. شەڕێکی درێژیان دەست پێکرد و عەمرۆ کوڕی مورسەد کوژرا و هاوڕێکانی هەڵاتن و ڕۆشتنە هەرات و پەیوەستی ئەوس کوڕی سەعلەبە بون. کوڕی خازم بۆ مەرو گەڕایەوە و ئەو کەسانەی لەبەکر کوڕی وایل کە لەمەرو بون، بۆ هەرات رایان کرد و پاشماوەکانی شارەکانی خوراسان رویان لەوێ کرد. دەستەی ئەوان فراوان و بەئەوس کوڕی سەعلەبەیان وت: لەسەر ئەو بنەمایە بەیعەتت لەگەڵ دەبەستین کە روبەڕوی کوڕی خازم ببیتەوە و موزەرییەکان لەخوراسان دەرپەڕێنیت. ئەو رازی نەبو. بەنی صوهەیب کە خزمەکانی بەنی جەحدەم بون، پێیان وت: ئێمە بەمە رازی نابین کە لەگەڵ موزەرییەکان لەیەك شاردابین لەکاتێکدا دەزانین ئەوان سلێمان کوڕی مورسەد و عەمرۆ کوڕی مورسەدیان کوشتوە. دەبێت لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەت لەگەڵ ئێمە

بکەیت وەگەرنە لەگەڵ کەسێکیتر بەیعەت دەکەین. رازی بو و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. کوڕی خازم بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و لەدۆڵێك لەنێوان خۆی و هەرات دابەزی. بەکریەکان پێشنیاری ڕۆشتنە دەر لەهەرات و هەڵکەندنی خەندەکیان پێکرد. ئەوس کوڕی سەعلەبە وتی: بەمشێوە نا، بەڵکو لەناو شاردا دەمێنینەوە و خۆڕاگری دەکەین. کارەکان لەسەر کوڕی خازم درێژ دەکەینەوە تا بێزار ببێت و خواستەکانی ئێمە بێنێتەدی. ئەوان بەمە رازی نەبون و ڕۆشتنەدەر و خەندەکیان هەڵکەند. کوڕی خازم بۆ ماوەی یەك ساڵ شەڕی لەگەڵ کردن. هیلالی زەببی پێی وت: لەگەڵ براکان و کوڕانی باوکی تۆ شەڕ دەکەین. ئەگەر ئەو بەڵای دەتەوێت بەسەر ئەوانیدا بهێنیت، ژیان دوای ئەوان هیچ سودێکی نیە. باشترە بەهەرەیەکیان پێ ببەخشیت و رەزامەندیان بکەیت و کۆتایی بەم کێشە بێنیت. وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر رێزی ئەوان خوراسان بەجێبێلین، رازی نابن. هیلال وتی: سوێند بەخوا نە من و نە کەسیتر چیتر شەڕ ناکەین تا فەرمانەکەی من ئەنجام بدەیت و داوای لێخۆش بون لەوان بکەیت. وتی: خۆت ببە بەنێردراوی من و ئەوان رازی بکە.

هیلال بۆ لای ئەوس کوڕی سەعلەبە بەرێکەوت و ئەوی بەخوا و خزمایەتی لەرێگەی (نزارەوە) سوێنددا رێز لەفەرمانڕەوایی ئەوان بگرێت. وتی: ئایا کەست لەبەنی صۆهەیب بینیوە؟ وتی: نا. دەڵێت: ئەو ڕۆشتەدەر و چاوی بەدەستەیەك لەهاورێکانی خۆی کەوت و ئاگاداری کردنەوە کە بۆ چ کارێك هاتوە. پێیان وت: ئایا چاوت بەبەنی صۆهەیب کەوتوە؟ وتی: کاری بەنی صۆهەیب لای ئێوە گەورە بوە و پێگەیان بەرز بۆتەوە. ڕۆشت و قسەی لەگەڵ کردن. وتیان: ئەگەر نێردراو نەبویتایە، دەمانکوشتی. پرسی: چ شتێك ئێوە رازی دەکات؟ وتیان: یەکێك لەم دو کارە، یا لەخوراسان بڕۆنە دەر یا هەمو کەرەستەکانی شەڕ و زێر و زیو و کشتوکاڵ  باروبنە بۆ ئێمە بەجێبێڵن و تەسلیمی ئێمەی بکەن.

ئەو بۆ لای کوڕی خازم گەڕایەوە. لێی پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟ ئاگاداری کردەوە. وتی: خەڵکی رەبیعە تەنانەت ئەو کاتەی پێغەمبەرەکەیان لەناو موزەریەکان هەڵبژێردرابو، لەخوای خۆیان تورە بون. کوڕی خازم لەوێ مایەوە و لەشەڕ دژی ئەوان پێداگری کرد. ڕۆژێك بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەی خەڵکانی رەبیعە، ئایا لەخوراسان بەم خەندەکەی

خۆتان رازی بون؟ ئەم قسەیە ئەوانی خرۆشان و کەوتنە خۆ. یەکتریان بۆ شەڕ هاندا. ئەوس کوڕی سەعلەبە ئەوانی لەشەڕی گشتی دورخستەوە و فەرمانی پێدان لەسەر شێوازی خۆیان شەڕ بکەن. ئەوان نافەرمانی ئەویان کرد. کوڕی خازم بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەمە بکەنە خۆراگرترین رۆژی خۆتان تا سەرکەوتن بەو کەسە ببڕێت کە لەشەڕدا خۆراگری زیاتر دەکات. کاتێك روبەروی ئەسپەکانی ئەوان دەبنەوە، رمەکانی خۆتان لەقورگ و سینەی ئەوان بچەقێنن. کاتژمێرێك شەڕیان کرد و خەڵکی بەکر کوڕی وایل شکستیان خوارد و هەڵاتن تا گەیشتنە خەندەکەکانی خۆیان و بەچەپ وراستدا بڵاوبونەوە. خەڵك کەوتنە ناو خەندەکەکان و بەسەختی کوشتار کران. ئەوس کوڕی سەعلەبە بۆ سیستان رایکرد و لەوێ یا نزیك لەوێ مرد. لەم رۆژەدا هەشت هەزار کەس لەخەڵکانی بەکر کوڕی وایل کوژران. کوڕی خازم دەستی بەسەر هەراتدا گرت و کوڕەکەی محەممەدی کردە فەرمانڕەوا و شەماس کوڕی دوساری عوتاردی پەیوەستی ئەو کرد و بوکەیر کوڕی وەساجی سەقەفی کردە سەرکردەی پاسەوانەکانی. کوڕی خازم بۆ مەرو گەڕایەوە.

لەم زەمانەدا تورکەکان هێرشیان کردە سەر کۆشکی (ئەسفاد) و کوڕی خازم فەرمانداری هەرات بو و کەسانێك لەخەڵکی ئەزد لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد. گەمارۆیان خستە سەر ئەوان. کەسیان بۆ لای کوڕی خازم رەوانە کرد. ئەو زوهەیر کوڕی حەیانی لەگەڵ بەنی تەمیم رەوانە کرد و پێی وت: ئاگاداربە لەشەڕ دژی تورکەکان خۆت بەدور بگرە. کاتێك ئەوانی بینی، هێرشی کردە سەرئەوان. ئەو لەرۆژێکی سارددا هێرشی کردە سەر ئەوان. کاتێك یەکیان بینی، هێرشیان کرد و تورکەکان شکستیان خوارد و هەڵاتن و ئەوان شوێنیان کەوتن و سەراسەری شەویان بەم کارەوە بەسەر برد. زوهەیر گەڕایەوە و دەستی لەتاو سەرما بەرمەکەیەوە نوسابو. چەورییان بۆ گەرم کرد و خستیە سەر دەستی. رۆنیان تێ سو و ئاگریان بۆ کردەوە و دەستی ئاوسا. دواتر بۆ هەرات گەڕایەوە. سابت کوڕی قوتنە ئەم هۆنراوەی هۆنیەوە:

| | |
|---|---|
| فدت نفسی فوراس من تمیم | علی ما کان من ضنك المقام |
| بقصر الباهلی و قدارانی | احامی حین حل به المحامی |
| بسیفی بعد کسر الرمح فیهم | اذ ودهم بذی شطب حسام |

اكر عليهم اليحموم كرا ككر الشرب انية المدام

فلو لا اللة ليس له شريك و ضربى قونس الملك الهمام

اذا فاظت نساء بنى دثار امام الترك بادية الخدام

یانی: گیانم قوربانی سوارەکانی خەڵکی تەمیم بێت کە لەشوێنی مانەوەی خۆیان گرفتاری تەنگانە بون. لەکۆشکی باهلی کاتێك پاسەوانی بارەگای خەڵکەکەی خۆمم دەکرد و لەم کاتەدا پاسەوانەکان کەم ببونەوە. بەشمشێرەکەی خۆم پارێزگاریم لەوان دەکرد و ئەمە دوای شکاندنی سەری ڕم لەجەستەی ئەوان بو کە شمشێری بڕمڕم لەکالان دەرکێشا و وەك شێرێکی دارستان هێرشم کردە سەر ئەوان. ئەسپە ڕەشەکەی خۆم بەردەوام بۆ سەر ئەوان غار پێدەدا و لەسەر لاشەکانی ئەوان دەمگێڕا بەهەمان شێوە کە مەیخۆرەکان قاپی شەراب لەناو خۆیاندا دەگێڕن، ئەگەر خواوەندی بێ هاوتای بێ شەریك نەدەبو، ئەگەر ئەوە نەدەبو کە من تیغی تیژ بۆ سەر ناوچاوی پاشایەکی ڕێزدار و گەورە، هێنایە خوار و لەناوەڕاستەوە کردم بەدولەت، ژنانی بەنی دەسار لەناوچبون و پاوانەکانی ئەوان دەردەکەوت.

## ( ئەوانەی بۆ لای خوا گەڕانەوە )

دەڵێن: کاتێك حسین کوژرا و کوڕی زیاد لەلەشکرگەکەی خۆی لەنوخەیلە گەڕایەوە و ڕۆشتە ناو کوفە، شوێنکەوتەکانی عەلی چاویان بەیەك کەوت و پەشیمان بونەوە و سەرکۆنەی یەکیان کرد. زانیان گوناحێکی گەورەیان ئەنجامداوە کە حسینیان بۆ کوفە بانگێشت کرد و دواتر هاوکاریان نەکرد و وەڵامی بانگەوازەکەی ئەویان نەدایەوە تا بەو شێوەیە لەگەڵ کەسانی بنەماڵەکەی کوشتار بکرێت. بوچونیان لەسەر ئەوە بەهێز بو کە ئەم پەڵە ڕەشە لەناوچاوی ئەوان پاك نابێتەوە مەگەر ئەوەی شەڕ دژی بکوژەکانی ئەو بکەن و هەمویان بکوژن. ئەوان لای پێنج لەڕێبەرانی شیعە لەکوفە کۆبونەوە: سولەیمان کوڕی سوردی خوزاعی، موسەییب کوڕی نەخەبەی فەزاری، عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی نوفەیلی ئەزدی، عەبدالله کوڕی والی تەمیمی و ریفاعە کوڕی شەدادی بەجلی. ئەمانە لەباشترین هاوەڵانی عەلی بون. لەماڵی سولەیمان کوڕی سوردی خوزاعی کۆبونەوە. موسەییب کوڕی نەخەبە دەستی بەقسە کرد و دوای سوپاس کردنی خوا وتی:

دوای سڵاو، ئێمە گرفتاری درێژبونەوەی ژیان و هەمو جۆرە ئاژاوەکان بوینەتەوە. داوا

لەخوا دەكەین نەمانخاتە ریزی ئەو كەسانەی بەیانی پێیان دەفەرمێت: ئایا ژیانی ئێوەمان درێژ نەكردوە كە هەر كەس بیەوێت، بكەوێتە خۆ و چارەنوسی خۆی بیربێنێتەوە؟ (فاطر/ ٣٥/ ٣٧) ئەو ئەندازە لەژیان كە خواوەند لەم ئایەدا ئاماژەی پێداوە، شەست ساڵە. هیچ كەسێك لەناو ئێمەدا نیە نەگەشتبێتە ئەم تەمەنە یا تەمەنی زیاتر نەبێت. ئێمە شەیدای پاك كردنەوەی خۆمان بوین بەڵام خواوەند ئێمەی سەبارەت بەكوڕی پێغەمبەرەكەی بەدرۆزن و فشەكەر بینی. پێشتر نێردراو و پەیك و پەیامەكانی ئەو بەئێمە گەیشتبو. ئێمەیش مژدەمان پێدا لە سەرەتاوە تا كۆتایی و بەنهێنی و ئاشكرا هاوكاری دەكەین. ئێمە هاوكاری خۆمان لەو درێغ كرد تا لای ئێمە كوژرا. ئێمە نەبەدەستی خۆمان هاوكاریمان كرد و نە بەزمانی خۆمان زیادمان لەو دورخستەوە و نە بەسامانی خۆمان هێزمان پێبەخشی و نە لەبەرابەر كەسەكانمان خوازیاری هاریكاری كردنی ئەو بوین. ئێستا كوڕی هاوڕێی خواوەند و كەسان و منداڵەكان و هاوەڵانی پێغەمبەر لەناو ئێمەدا كوژراون. چ بەڵگەیەكمان بۆ دەرگای خواوەند و بارەگای پێغەمبەرەكەی پێیە؟. سوێند بەخوا هیچ بەڵگەیەكمان نیە مەگەر ئەوەی كوشتاری بكوژەكان و خراپەخوازەكانی ئەوان بكەین یا لەم رێگادا بكوژرێین. هیوادارم خوا بەمە لەئێمە رازی بێت. من دڵنیا نیم لەكاتی بینینی خواوەند، لەسزاكانی ئەو بەدور بم. ئەی خەڵكینە، فەرماندەیەك و فەرماندارێك بۆ خۆتان دەست نیشان بكەن چونكە ناچار دەبێت سەرپەرەستێكتان هەبێت تا پەنای بۆ ببەن و ئاڵایەك كە لەژێریدا كۆببنەوە.

ریفاعە كوڕی شەداد هەستا و وتی: دوای سڵاو، خواوەند تۆی بۆ هێنانە سەرزمانی ئەم قسەیە رێنوێنی كرد و چونكە ئێمەت بۆ شەڕ لەگەڵ ئەم خراپەكارانە و گەڕانەوە بۆ لای خوا هاندا، پێشنیاری باشترین كارت بەئێمە كرد. گوێڕایەڵی تۆین و بەوتارەكەت رازین. وتی: كەسێك هەڵبژێرن تا پەنای بۆ ببەن و ئاڵایەك كە لەژێریدا كۆببنەوە. ئەمە بۆچونی منە. ئەگەر تۆ پیاوی ئەم ناوچەیت، لای ئێمە پەسەندكراو، لەناو گۆڕەكانمان خۆشەویست، لای ئێمە چاكەكار و بۆ ئێمە باشترین هەڵبژاردەیت. ئەگەر رازی بیت و هاورێكانمان رازی بن، ئەم كارە بە پیری شیعەكان و هاوەڵی پێغەمبەر و هەڵگری پێشینەی درەخشان و پێگەی بەرز، بەسولەیمان كوڕی سوردی خوزاعی دەسپێرین كەكەسێكی دیندار و دورئەندێشە.

عەبدالله کوڕی سەعدیش هاوشێوەی ئەوان قسەی کرد. ئەم دوانە (ریفاعە کوڕی شەداد و عەبدالله کوڕی سەعد) سولەیمان کوڕی سورد و موسەییب کوڕی نەخەبەیان وەسف کرد. موسەییب وتی: بەخوا گەیشتن، سولەیمان کوڕی سورد وەك ڕێبەری خۆتان دەستنیشان بکەن.

لەم کاتەدا سولەیمان کوڕی سورد دەستی بەقسە کردن کرد و سوپاسی خوای کرد و وتی: دوای سلاو، ژیانی ئەم ڕۆژگارە بەرەو بەدبەختی دەڕوات و دەرد و ئەزمونەکەی دژوار و ستەمکاری بۆتە گشتگیر و هەمو گەورەکانی شیعەی گرتۆتەوە. لە ئاوا ڕۆژگارێك، دەترسم کۆتایی کارە بەفیڕۆچوەکانی ئێمە بەرەو بەختەوەری و ڕزگاری نەڕوات. ئێمە، لەرابردودا، بەردەوام هاوارمان دەکرد تا منالەکان و کەسانی پێغەمبەر بەرەو لای ئێمە بێن. هیوای هاوکاریمان پێدان و پێداگریمان کرد تا لەزوترین کاتدا بێنە لای ئێمە. کاتێك هاتن، سستیمان کرد و ناتەوانیمان لەخۆمان نیشاندا و چاوەڕێ بوین تا کوڕی پێغەمبەر و بنەماڵەکەی لەناو ئێمەدا کوژرا لەکاتێکدا داوای هاوکاری دەکرد و خوازیاری دادپەروەری بو، بەلام پێیان نەبەخشی. خراپەکاران ئەویان کردە نیشانەی تیرەکان و هەلدێرێك بۆ ڕمەکانی خۆیان تا کوشتیان و هێرشیان کردە سەر و تالانیان کرد و ماڵ و سامانی ئەویان بەفیڕۆدا و جەستەکانیان لەجل وبەرگ روت کردەوە. ئێستاکە، هەستن چونکە خوا لەئێوە تورەیە. بۆ لای ژن و منالەکانتان مەگەڕێنەوە تا خوا رازی بێت کە گومان ناکەم رازی ببێت مەگەر ئەوەی شەڕ لەگەڵ بکوژەکانی ئەوان بکەن. لەمەرگ مەترسن چونکە هیچ کەس لەمەرگ نەترسا مەگەر ئەوەی ریسوا بو. وەك خەلکی ئیسرائیل مەبن کە پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: ئێوە ستەمتان لەخۆتان کرد، بۆ خوا بگەڕێنەوە و کوشتاری یەك بکەن ) (بقرە/٢/٥٤). ئەو کارەیان کرد و کەوتنە سەر ئەژنۆ و گەردنیان بەرز کردەوە چونکە دەیانزانی لەو گوناحە گەورانە تەنیا بەکوشتاری یەکتر ڕزگاریان دەبێت. ئێوە چی دەکەن ئەگەر پێشنیاری کارێکی لەم شێوەتان پێ بکرێت؟ شمشێرەکان تیژ بکەن و ڕمەکان ئامادە بکەن و هەرچەندە دەتوانن بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان کەرەستەی شەڕ و پیاوی شەڕکەر و ئەسپە تیژپێکان کۆبکەنەوە (انفال/٨/٦٠) تا بۆ گۆڕەپانی شەرتان ببەن و ڕێکتان بخەن.

خالید کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل وتی: ئێستاکە بزانن ئەگەر گومان بکەم بەکوشتنی

خۆم دەتوانم لەم گوناحە رزگارم بێت و خواوەند رازی دەکەم، بێ درەنگ ئەو کارە دەکەم. من هەموئەو کەسانەی لێرەن، بەشایەت دەگرم کە هەرچی سامانم هەیە (جگە لەشمشێرەکەم) تایبەتە بەموسوڵمانان تا بەمشێوە لەشەڕ دژی خراپەکاران هاوکاری و بەهێزیان بکەم. دواتر ئەبولوعتەمەر کوڕی حەبس کوڕی رەبیعەی کەنانی هاوشێوەی خالد قسەی کرد. سوڵەیمان وتی: بەسە، هەر کەس دەیەوێت ئەو کارە بکات، بڕواتە لای عەبدالله کوڕی والی تەمیمی. کاتێك ئەوەی دەتانەوێت، کۆی بکەنەوە، بیبەنە لای ئەو، شوێنکەوتە راستەقینە و یەك دڵەکانی ئێوە کۆدەکەینەوە.

سوڵەیمان کوڕی سورد بۆ سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان پەیك و پەیامی نارد و نامەی نوسی و ئەوی (هاورێ لەگەڵ شیعەکانی مەداین) لەمەبەستەکەی خۆیان ئاگادار کردەوە و داوای هاوکاری لێکردن. سەعد کوڕی حوزەیفە نامەکەی بۆ شیعەکانی مەداین خوێندەوە. ئەوان وەڵامی داواکاریەکەی ئەویان دایەوە و بۆ سوڵەیمان کوڕی سوردیان نوسی و ئاگاداریان کردەوە کە مەبەستیانە بەرەو لای ئەوان بەرێکەون و هاوکاریان بکەن.

هەروەها، سوڵەیمان بۆ موسەنا کوڕی موخەرریبەی عەبدی لەبەسرە نامەی نوسی و مەبەستەکەی لەگەڵدا باس کرد. موسەنا لەوەڵامدا نوسی: ئێمە شیعەکان سوپاسی خوا دەکەین کەئێوە مەبەستی ئەو کارەتان هەیە. ئێمە لەکاتی دیاریکراو دێینە لای ئێوە. لەکۆتایی نامەکەی خۆی نوسی:

| | |
|---|---|
| تبصر كاني قد اتيتك معلما | على اتلع الهادى اجش هزيم |
| طويل القرا نهد الشواة مقلص | ملح على فا:ن '''ا:ا'م ازوم |
| بكل فتى لا يملا الروع قلبه | محش لنار الحرب غير سووم |
| اخى ثقة ينوى الاله بسعيه | ضروب بنصل السيف غير اثيم |

یانی: هاورێی من، بڕوانە و ئارام بە کە بێزار نەبو وئاشکرا دێمە لای تۆ و لەم رێگادا سوار خرۆشانترین سەمەند دەبەم کە مایینێکە تیژپێ، بەردەوام دەخرۆشێت و دەنگی هاوشێوەی هەورەبروسکەی ئاسمانە. کەمەری کێشراو و درێژ، پێستی سەری بەرزبۆتەوە و قاچەکانی درێژ هاوشێوەی ستونەکانی تەختی خواوەندە. بەردەوام زەخت لەئاسنی هەوسارەکەی دەکات و هاوشێوەی شێرێکی دڕندەیە. لەگەڵ دەستەیەك لەگەنجەکان دێم

کەترسی شەڕ دڵی ئەوان ناگرێتەوە، ئاگری شەڕ خۆش دەکەن و هەرگیز بێزار نابن. ئەو برایانەی بەهێز و هەر کار و پەیمانێك کەدەیدەن تەنیا بۆ خوایە. خراپەکاران بەشمشێر لەناو دەبەن و خۆیان بەگوناح پیس ناکەن.

یەکەم کار کەدوای کوژرانی حسین کردیان، لەساڵی ٦٨١/٦١ زایینی ئەنجامدرا. ئەوان بەردەوام ساز و بەرگ و کەرەستەی شەڕیان کۆدەکردەوە و خەڵکیان بەنهێنی بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی حسین هاندەدا. کەسانێك لەملاولا وەڵامی بانگەوازەکەی ئەوانیان دایەوە. بەردەوام بەمشێوە بون تا یەزید کوڕی معاویە لەساڵی ٦٤/ ٦٨٤ زایینی مرد. کاتێك یەزید مرد، هاتنە لای سولەیمان کوڕی سورد و پێیان وت: پیاوە ستەمکارەکە لەناو چوە و فەرمانڕەوایی خراپەکاران بەرەو لاوازی دەڕوات. ئەگەر بتەوێت، دژی عەمرۆ کوڕی حورەیس شۆڕش دەکەین (ئەو جێگری کوڕی زیاد بو لەکوفە)، دواتر مەبەستی خۆمان یانی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسین ئاشکرا دەکەین و شوێن بکوژەکانی دەکەوین و خەڵك بۆ فەرمانبەری لەم بنەماڵە هان دەدەین نەك فەرمانبەری لەکەسانێك، کەسانیتر بەنەشیاوی ئەوانیان پێشخست و ئەوانیان لەمافی خۆیان بێ بەش کرد.

سولەیمان کوڕی سورد وتی: پەلە مەکەن. من بەوردی سەیری بارودۆخم کرد و بینیم بکوژەکانی حسین گەورەکانی کوفەن و پاڵەوانانی عەرەب و دەبێت تۆڵەی خوێنی حسین لەمان داوا بکەین. هەرکاتێك لەمەبەستەکەی ئێوە ئاگادار ببنەوە، دەبنە دوژمنترینی خەڵکان بۆ ئێوە. سەیری شوێنکەوتەکانی خۆم کرد لەناو ئێوەدا و زانیم ئەگەر شەڕ دەست پێبکەن، نابنە خاوەنی خوێنی خۆیان و ناتوانن تۆڵەی خوێنی خۆیان بکەنەوە و دڵەکانیان ئارام بکەن بەڵکو دەبنە خۆراکی شمشێری دوژمنانی خۆیان. لەجیاتی ئەوەی ئاماژەتان پێدا، بانگەوازەکەی خۆتان بۆ هەر سوچ و قوژبنێك ببەن و داوای هاوکاری لەخەڵك بکەن. ئەو کارەیان کرد و دوای مردنی یەزید، خەڵکانێکی فراوان وەڵامی بانگەوازەکەی ئەوانیان دایەوە.

دواترخەڵکانی کوفە، عەمرۆ کوڕی حورەیسیان دەرپەڕاند و لەگەڵ کوڕی زوبەیر بەیعەتیان کرد. سولەیمان کوڕی سورد و هاوڕێکانی خەڵکیان بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسین هاندەدا.

کاتێك شەش مانگ بەسەرمردنی یەزید تێپەڕی کرد، موختار کوڕی ئەبی عوبەیدە لەنیوەی رەمەزان/ ٦ ژوئەنی ٦٨٤ زایینی وەك فەرماندار لەلایەن کوڕی زوبەیرەوە هاتە ناو کوفە. هاوڕێ لەگەڵ ئەو ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە وەك سەرپەرەستی دامەزراوەی باج گەیشتە کوفە. موختار خەڵکی بۆ شەڕ دژی بکوژەکانی حسین هاندەدا و دەیوت: لەلایەن (سوشیانس) (مەهدی) محەممەد کوڕی حەنیفە هاوشێوەی وەزیرێك هاتومە لای ئێوە. دەستەیەك لەشیعەکان پەیوەستی بون. ئەو بەردەوام دەیوت: سوڵەیمان دەیەوێت شۆڕش بکات و خۆی و هاوڕێکانی بەکوشتن بدات، ئەو زانیاری لەسەر کاروباری شەڕ نیە. هەواڵی ئەم کارانە بە عەبدالله کوڕی یەزیدی ئەنساری گەیشت کە دەیانەوێت لەشاری کوفە، لەم رۆژانە، دژی ئەو شۆڕش دەست پێبکەن. پێیان وت کە (موختار یا سوڵەیمان!؟) بخاتە زیندان. بەڵام ئەویان لەئەنجامی کارەکەی ترساند کەئەگەر رێگەی لێ نەگیرێت، کارێکی گەورە و دژوار پێشدێت.

عەبدالله وتی: ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئێمە بکەن، روبەرویان دەبینەوە و ئەگەر کاریان بەئێمە نەبێت، شوێنیان ناکەوین. ئەوان داوای خوێنی حسین دەکەن. خوا لەم خەڵکە خۆش بێت، ئەوان ئارام و ئاسودەن، رێگەیان بدەن بەئاشکرا بێنەدەر و هێرش بکەنە سەر بکوژەکانی حسین (مەبەستەکەی کوڕی زیاد بو). من پشتیوانی ئەوانم. ئێستا، کوڕی زیاد، بکوژی باشترین کەسی ئێوە بەرەو لاتان دێت. شەوی پێشتر ئەویان لەسەر پردی مینبەج بینیوە. شەڕ کردن لەگەڵ ئەو باشترە لەوەی زیانتان لەناو خۆتانا بڵاو بکەنەوە و کوشتاری یەك بکەن و ئەوسا کاتێك روبەروی دوژمن ببنەوە، کە ناتەوانن و ئەمە باشترین ئاواتی دوژمنەکەتان بێت. دوژمنترین ئافرێنراوی خوا بۆ ئێوە، بەرەو لای ئێوە دێت. خۆی و باوکی بۆ ماوەی حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی ئێوەیان کرد و لەکوشتنی چاکەکاران و خۆپارێزان خۆیان بەدور نەگرت. ئەوە ئێوەی کوشتار کردوە ولەوە زیانتان پێگەیشتوە. ئەو کەسێکی کوشتوە کە داوای خوێنەکەی دەکەن. ئەو بەرەولای ئێوە دێت. بەهەمو هەوڵ و تیژی شمشێرەکانتان پێشوازی لێ بکەن. زیان بەسەر ئەودا ببارێنن نەك خۆتان. من چاکەی ئێوەم دەوێت.

لەم زەمانەدا مەروان کوڕی حەکەم، کوڕی زیادی بۆ سەرکوت کردنی خەڵکی جەزیرە رەوانە کردبو و فەرمانی پێدابو هەرکاتێك لەوێ تەواو بو، روبکاتە عێراق.

کاتێك عەبدالله کوڕی یەزید، کۆتایی بەوتەکەی خۆی هێنا، ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە وتی: ئەی خەڵکینە، وتەکانی ئەم پیاوە ئاشتی خوازە ئێوە نەکاتە نیشانەی شمشێر و سەرکوت کردن. سوێند بەخوا ئەگەر شۆڕشگێڕێك روبەرومان ببێتەوە، دەیکوژین و ئەگەر بزانین دەستەیەك دەیانەوێت دژی ئێمە راپەڕن، بێ گومان باوك بەگوناحی کوڕ و هاورێ لەتاوانی هاورێ و سەرپەرەست بەتاوانی ژێردەستەکانی لەناو دەبەین تا سەر بۆ راستی و دروستی دانەوێنن و بەریسواییەوە فەرمانبەری خۆیان دەربڕن.

موسەییب کوڕی نەخەبە هەستا و قسەکەی بڕی و وتی: ئەی کوڕی پەیمان شکێنەکان، ئایا ئێمە لەشمشێر و سەرکوتی خۆت دەترسێنیت! سوێند بەخوا تۆ لاوازتر و ریسواتر لەوەیت! ئێمە سەرکۆنەی تۆ ناکەین کەبۆچی کینەی ئێمەت لەدڵدایە چونکە باوك و باوەگەورێی تۆمان کوشت. بەڵام تۆ ئەی فەرماندار، بۆچونێکی راستت نیشاندااین.

ئیبراهیم وتی: سوێند بەخوا تۆ دەکوژرێیت و ئەم پیاوە (عەبدالله کوڕی یەزید) رێگەی سازان وئاشتی دەگرێتەبەر. عەبدالله کوڕی وال وتی: تۆ سەرپەرەستی دامەزراوەی باجیت، باجی خۆت وەربگرە. ئەگەر کاروباری ئەم ئۆمەتە بەفیرۆ بدەیت، جێی سەرسورمان نیە چونکە باوك و باوەگەورێی تۆیش ئەو کارەیان ئەنجام داوە و تاڵاوەکەیان چێشت. کەسانێك لەهاوەڵانی ئیبراهیم جوێنیان بەواندا و هەردولا قسەی ناشیرینیان هێنایە سەرزمان. فەرماندار لەسەر تەختی وتاردان هاتەخوار. ئیبراهیم هەڕەشەی لێکرد کە سکاڵاکەی دەباتە لای کوڕی زوبەیر. عەبدالله ڕۆشتە ماڵەکەی ئیبراهیم و داوای لێخۆشبون و بەخشینی کرد کە رازی بو. دواتر هاورێیانی سوڵەیمان هاتنەدەر و بەشێوەیەکی ئاشکرا دەستیان بەکڕینی چەك و کەرەستەکانی شەڕ و خۆئامادە کردن و کۆکردنەوەی شەڕکەران کرد.

## جیابونەوەی خەواریج لەکوڕی زوبەیر

لەم ساڵەدا ئەو دەستە لەخەواریج کە هاتبونە مەککە، لەکوڕی زوبەیر جیابونەوە. ئەوان بەهاوکاری ئەو شەڕیان لەگەڵ خەڵکانی شام کردبو.

هۆکاری هاتنی ئەوان ئەوە بو کە دوای کوژرانی ئەبو بیلالی مەرداس، کوڕی زیاد ناوچەکەی لەوان تەنگ کرد. لەناو خۆیاندا کۆبونەوە و سەبارەت بەپێشهاتەکان

گفتوگۆیان کرد. نافع کوڕی ئەزرەق بەوانی وت: خوا قورئانی رەوانە کردوە و شەڕی لەرێگای خوا کردۆتە ئەرکێکی پێویست و بەروناك کردنەوەی رێگا و نیشاندانی چەوتی و خواریەکان، بەڵگەی بۆ ئێوە هێناوەتەوە. ستەمکاران شمشێرەکانی خۆیان بۆ ئێوە لەکالآن دەرکێشاوە. هاورێ لەگەڵ من وەرنە لای ئەو پیاوە کە لەمەککە ئالآی شۆڕشی هەلکردوە. ئەگەر بۆچونەکانی لەگەڵ ئێمە یەك بێت، بەهاوکاری ئەو شەڕ دەکەین و ئەگەر بەپێچەوانەی بۆچونەکانی ئێمە بێت، لەمالی خوا دوری دەخەینەوە. لەم کاتەدا سوپای شام بەرەو لای کوڕی زوبەیر رەوانە ببو.

خەواریج بەرێکەوتن تا لای کوڕی زوبەیر دابەزین. ئەو لەهاتنی ئەوان شادمان و پێی وتن کە بێ پرسیار کردن هاورای ئەوان و بۆچونەکانیان یەکێکە. ئەوان بەهاوکاری ئەو شەڕیان لەگەڵ خەڵکانی شام کرد تا یەزید کوڕی معاویە مرد و خەڵکانی شام گەڕانەوە.

دواترکۆبونەوە و وتیان: ئەوەی دوێنێ ئەنجامتاندا، بیرکردنەوە و فرەزانی تیا نەدەبینرا. لەگەڵ پیاوێك شەڕ دەکەن کە ئەگەری هەیە هاورای ئێوە نەبێت. دوێنێ خۆی وباوکی شەڕی ئێوەیان دەکرد و هاواریان دەکرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای تۆڵەی عوسمان دەکەن! بڕۆنە لای ئەو و لەبیروبۆچونی سەبارەت بەعوسمان پرسیار بکەن. ئەگەر بێزاری لەعوسمان دەربڕی، سەروەری ئێوەبێت. ئەگەر لەم کارە خۆی بەدور گرت، بێ گومان دوژمنی ئێوەیە. رۆشتنە لای و پرسیاریان لێکرد. ئەو سەیری کرد و بینی هاوەلآنی کەمن. وتی: کاتێك هاتونەتە لای من کەدەمویست هەستم (بۆ نوێژ یا شەڕ). بڕۆن و ئێوارێ بگەڕێنەوە تا لەوەی پێویستە، ئاگادارتان بکەمەوە.

ئەوان گەڕانەوە و کوڕی زوبەیر کەسی بەدوای هاوەلآنی خۆی رەوانە کرد و ئەوانی تەیار بەکەرەستەکانی شەڕ لەدەوری خۆی کۆکردەوە. خەواریج هاتن و بینیان هاورێکانی لەدەوری ئەو کۆبونەتەوە و گورزیان لەدەستایە. کوڕی ئەزرەق بە هاوەلآنی خۆی وت: ئەم پیاوە مەبەستی ناسازگاری لەگەڵ ئێوەی هەیە. نافع کوڕی ئەزرەق و عوبەیدە کوڕی هیلال هەنگاویان بردە پێش و دواتر عوبەیدە دوای سوپاس کردنی خوا وتی:

دوای سلآو، خواوەند محەممەدی رەوانە کرد تا خەڵکەکەی بۆ پەرستینی خوا هان بدات و ئایینەکەی خۆی تایبەت کرد بەو. ئەو بانگەوازەکەی راگەیاند و موسوڵمانان وەلآمیان

دایەوە. پێغەمبەر لەنێوان ئەوان لەسەر بنەمای نوسراوی خوایی کردارەکانی ئەنجام دەدا تا خوا ئەوی بۆ لای خۆی بردە و دواتر خەڵك ئەبوبەکریان هێنایە سەرکار و ئەبوبەکر عومەری کردە جێگری خۆی. هەردوکیان لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر کاروبارەکانیان ئەنجام دەدا. دواتر خەڵك عوسمانیان بۆ خەلافەت هەڵبژارد. ئەو ڕێزی لەخزمەکانی خۆی گرت و لەپێشی بەنزیکەکانی بەخشی و گەنجێکی خراپەکاری کردە فەرمانڕەوا و قامچی هەڵگرت و داردەستەکەی لەناو خەڵکدا دەسوڕاند، کەسێکی هێنایە سەرتەخت کەپێغەمبەر لەخۆی دوریدەکردەوە و هەڵگرانی لەپێشی لەدین و ڕێزداری پشت گوێ خست. بەخششە خواییەکان کەتایبەتە بەموسوڵمانان، لەناو خراپەکارانی قوڕەیش و هەرزەکارانی عەرەب بلاوی کردەوە. لەبەر ئەمە دەستەیەك هێرشیان کردە سەری و خوێنیان ڕشت. لەسەر ئەم بنەمایە، ئێمە لەکوڕی عەفان و شوێنکەوتەکانی ئەو بێزارین. ئەی کوڕی زوبەیر، تۆ دەڵێی چی؟ کوڕی زوبەیر وتی: ئەوەی سەبارەت بەپێغەمبەر ئاماژەت پێدا، تێگەیشتم. ئەو گەورەتر لەوەیە کە باست کرد. ئەوەی سەبارەت بەئەبوبەکر و عومەر هێناتە سەرزمان، تێگەیشتم، لێرەیشدا کەسێکی بەختەوەریت و لەراستی و دروستی نزیك بویتەوە. ئەوەی سەبارەت بەعوسمان باست کرد، زانیم. ئەمڕۆ من کەس لەبەندەکانی خوا سەبارەت بەچارەنوسی عوسمان و ئەنجامی کارەکانی ئەو بەشارەزاتر نازانم. کاتێك ئەم خەڵکە گەمارۆیان خستەسەر، لەگەڵی بوم. هیچ کارێکی پشت گوێ نەخست مەگەر ئەوەی داوای لێخۆشبونی لەوان کرد و مەبەستەکانی ئەوانی هێنایە دی. دواتر بەنامەیەك گەڕانەوە کە گومانیان دەکرد، ئەو نامەکەی نوسیوە و فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکردوە. بەوانی وت: من ئەم نامەم نەنوسیوە، ئەگەر دەتانەوێت شایەتەکانی خۆتان بێنن و بەڵگەی خۆتان نیشان بدەن و ئەگەر ناتانەوێت، سوێند دەخۆم. سوێند بەخوا ئەشایەتێان هێنا ئەبەڵگە و ئەویان ناچار بەسوێند خواردن کرد. هێرشیان کردە سەر و خوێنیان ڕشت. بیستم چ رەخنەیەکت لێدەگرت. بەو شێوە ئەبو کە تۆ ئاماژەت پێدا. بەڵکو شیاو بۆ هەر چاکەیەك بو. من ئێوە و کەسانی ئامادەبو لێرە بەشایەت دەگرم کە شوێنکەوتەی کوڕی عەفان و دوژمنی خراپەخوازەکانی ئەوم. خوا لەئێوە بێزارە.

دواتر بلاوەیان لێکرد و ئەم کەسانە رویان لەبەسرە کرد: نافع کوڕی ئەزرەقی حەنزەلی،

عه‌بدالله كوڕی صه‌فاری سه‌عدی، عه‌بدالله كوڕی ئه‌باز، حه‌نزه‌له كوڕی به‌یهه‌س، عه‌بدالله كوڕی ماحوز، عوبه‌یدالله كوڕی ماحوز و زوبه‌یر كوڕی ماحوز (ئه‌م سیانه له‌به‌نی سه‌لیت كوڕی یه‌ربوع) و هه‌موویان له‌خه‌ڵكانی ته‌میم. ئه‌م كه‌سانه رویان له‌یه‌مامه كرد: ئه‌بو تالوت (تالب) له‌به‌نی به‌كر كوڕی وایل، ئه‌بو فوده‌یك عه‌بدالله كوڕی سوه‌ر كوڕی سه‌عله‌به و عه‌تیه كوڕی ئه‌سوه‌دی یه‌شكری. ئه‌وان له‌وێ به‌سه‌ركردایه‌تی كوڕی تالوت شۆڕشیان ده‌ست پێكرد. دواتر له‌ده‌وری كوڕی تالوت بڵاوەیان لێكرد و له‌ده‌وری نه‌جده كوڕی عامری حه‌نه‌فی كۆبونه‌وه.

به‌ڵام نافع و هاوڕێكانی رویان له‌به‌سره كرد و ڕۆشتنه ئه‌هوشاره. ئه‌وان شوێن بۆچونه‌كانی كوڕی مه‌رداس كه‌وتبون. جارێك راوێژیان كرد و سه‌بارەت به‌شه‌ڕ كردن له‌رێگه‌ی خوا، گفتوگۆیان له‌گه‌ڵ یه‌ك كرد. نافع هێرشی كرده سه‌ر سێسه‌د پیاوی شه‌ڕكه‌ر و ئه‌مه له‌كاتی خرۆشانی خه‌ڵك دژی كوڕی زیاد ئه‌نجامدرا و هاوكات بو له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی خه‌واریج ده‌رگای زیندانه‌كانیان كرده‌وه و هاتنه‌ده‌ر و خه‌ڵك ئه‌وانی له‌بیركرد و به‌شه‌ڕ له‌نێوان هێزه‌كانی ئه‌زد و ته‌میم و ره‌بیعه سه‌رقاڵ بون. كاتێك نافع هاته‌ده‌ر، شوێنی كه‌وتن (یا به‌دوای ئه‌ودا به‌رێكه‌وتن). خه‌ڵكانی به‌سره بۆ فه‌رمانبه‌ری كردن له‌عه‌بدالله كوڕی حارس رێككه‌وتن و خه‌ڵك ئاسوده بون و شوێن خه‌واریج كه‌وتن و ئه‌وانیان تۆقاند. نافع له‌شوالی ساڵی ٦٤/ ژوئه‌نی ٦٨٤ زایینی ڕۆشته ئه‌هواز و ئه‌و كه‌سانه له‌وان كه له‌به‌سره مانه‌وه، ڕۆشتنه لای كوڕی ئه‌زره‌ق و ئه‌مه جیاواز له‌و كه‌سانه بو كه نه‌یانده‌ویست، هه‌مان ڕۆژ به‌رێكه‌ون وه‌ك: عه‌بدالله كوڕی صه‌فار و عه‌بدالله كوڕی ئه‌باز و چه‌ند كه‌سێكیتر كه ئه‌ندێشه‌ی ئه‌وانیان له‌سه‌ردابو. نافع له‌كاروباره‌كانی خۆی وردبویه‌وه و له‌سه‌ر بنه‌مای گومانه‌كانی خۆی گه‌یشته ئه‌و ده‌رئه‌نجامه‌ی كه‌سه‌ركردایه‌تی ئه‌و كه‌سانه‌ی ده‌ستیان له‌شه‌ڕ كردن له‌رێگه‌ی خوا هه‌ڵگرتوه، بۆ ئه‌و ره‌وا نیه و ئه‌و كه‌سه‌ی واز له‌شه‌ڕ كردن بێنێت، رێگه‌یه‌كی بۆ رزگاربون نیه. ئه‌و ئه‌م ئه‌ندێشه‌ی له‌گه‌ڵ هاوڕێكانی باس كرد و ئه‌وانی بۆ ده‌ربڕینی بێزاری له‌و خه‌ڵكه هاندا و رایگه‌یاند كچ به‌شودان و هاوسه‌ر گرتن له‌وان و خواردنی گۆشتی سه‌ربڕاوی ئه‌وان ره‌وا نیه و شایه‌تی ئه‌وان وه‌رناگیرێت و ناتوانرێت زانسته دینیه‌كان له‌وانه‌وه فێر ببین و میراتی ئه‌وان بۆ ئێمه حه‌رامه. ئه‌و رایگه‌یاند خه‌واریج

بڕۆنە هەر شوێنێك و دەستی بەسەردا بگرن، پێویستە هەمو خەڵکان بەپیر و منداڵیشەوە لەبەردەم خۆیان تێپەڕێنن و هەر کەسێکیان لەگەڵ خۆیان بەناسازگار بینی، دەستبەجێ بیکوژن. هەمو موسوڵمانان، کافرانێك هاوشێوەی کافرە عەرەبەکانن کەتەنیا بەباوەڕ هێنان یا کوژران دەتوانین دەستبەرداریان ببین.

دەستەیەك وەڵامی ئەم بانگەوازەیان دایەوە و دەستەیەك پاشەکشێیان کرد و لێی جیابونەوە. لەوکەسانەی لێی جیابونەوە: یەکیان نەجدە کوڕی عامر بو کە بەرەو یەمامە بەرێکەوت و ئەو خەواریجەی لەوێ بەسەریان دەبرد، ئەویان وەك رێبەری خۆیان هەڵبژارد و لەدەوری کوڕی تالوت بڵاوەیان لێکرد. نافع بۆ کوڕی ئەباز و کوڕی سەفار و هاورێکانی ئەم دوانە نامەی نوسی و داوای لێکردن شوێن بۆچونەکانی ئەمان بکەون. کوڕی سەفار نامەکەی خوێندەوە بەڵام بۆ هاورێکانی خۆی نەخوێندەوە لەبەر ئەوەی نەوەك بڵاوەی لێبکەن و رێگەی ناسازگاری بگرنەبەر. کوڕی ئەباز نامەکەی خوێندەوە و وتی: خوا بیکوژێت، ئاماژەی بە چ ئەندێشە و بۆچونێك داوە! نافع راست دەکات. ئەگەر ئەم خەڵکە بتپەرەست دەبون، ئەو راستگۆترینی خەڵکان دەبو و شێوازەکەی لەشێوازی پێغەمبەرەوە نزیکتر. ئەو درۆی کردوە، ئەم خەڵکە لەبتپەرەستیەوە دورن بەڵام بەبەخشینە خواییەکان و فەرمانە دینیەکان ناباوەڕن و جگە لەخوێنی ئەوان هیچ شتێك بۆ ئێمە رەوا نیە، جگە لەمە هەرچی بێت، بۆ ئێمە ناڕەوایە.

کوڕی صەفار وتی: خوا لەتۆ بێزار بێت کە کەمتەرخەمیت لەدینەکەیدا کرد و خوا لەکوڕی ئەزرەق بێزار بێت کە سنورەکانی بەزاند، یەکێتر وتی: خوا لەویش و لەتۆ، لەهەردوکتان، بێزار بێت.!

ئەوان بڵاوەیان لێکرد وگلەیی کوڕی ئەزرەق فراوان و گەشەی کرد و شوێنکەوتەکانی زۆر بون. ئەو لەئەهواز مایەوە و باجی وەردەگرت و خۆی پێ بەهێز دەکرد. دواتر روی کردە بەسرە تا لەپردەکە نزیك بویەوە. عەبدالله کوڕی حارس، موسلیم کوڕی عوبەیس کوڕی کورەیز کوڕی رەبیعەی لەخەڵکی بەسرە بۆ روبەرو بونەوەی ئەو رەوانە کرد.

## هاتنی موختار بۆ کوفە

شیعەکان بەردەوام جوێنیان بەموختار کوڕی ئەبی عوبەیدە دەدا و سەرکۆنەیان دەکرد، هۆکاری ئەم کارە، ئەو روبەروبونەوە کە ئەو لەداستانی حسین کوڕی عەلی لەگەڵ ئەودا هەیبو و ئەمە لەکاتێکدا بو زەربەتی کێردیان لەحەسەندا و دواتر هاوڕێکانی ئەویان بە (ابیض مداین) ناو دەبرد ( و موختار بەباوکی خۆی وت: با حەسەن بەند بکەین و تەسلیمی معاویەی بکەین). کاتێك رۆژگاری حسین کوڕی عەلی گەیشت و ئەو موسلیم کوڕی عەقیلی رەوانەی کوفە کرد، موختار لەگوندێك بەناوی لەقفخا بو. هەواڵی کوڕی عەقیلی پێگەیشت کە لەکاتی نیمەڕۆ بزوتنەوەکەی خۆی دەست پێکردوە. هاتنەدەرەوەی موسلیم بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا، لەسەر بنەمای وادەیەکی دیاریکراو نەبو. موختار لەگەڵ هاوڕێکانی خۆ بەرێکەوت و ماوەیەك دوای ئاوا بونی خۆر، لەشەودا، گەیشتە دەروازەی پیل. عوبەیدالله کوڕی زیاد، عەمرۆ کوڕی حورەیسی بەئالآیەك لەدەست لەبەردەرگای مزگەوت دانابو. موختار سەرگەردان لەشوێنەکەی خۆی مایەوە و نەیدەزانی دەبێت چی بکات. ئەم هەواڵە بەعەمرۆ کوڕی حورەیس گەیشت کە بانگی کرد و ئەمانی پێبەخشی و موختار لای ئەو مایەوە.

کاتێك بەیانی گەیشت، عومارە کوڕی وەلید کوڕی عوقبە، هەواڵی کاری ئەوی بەعوبەیدالله کوڕی زیاد گەیاند. کوڕی زیاد ئەوی هاورێ لەگەڵ ئەو کەسانەی ڕۆشتنە لای، بانگ کرد. لێی پرسی: تۆ ئەو کەسەیت هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەهاوڕێکانت بۆ هاوکاری کردنی موسلیم کوڕی عەقیل هاتویتە ئەم شارە؟ موختار وتی: هاوکاریم نەکردوە بەڵکو هاتوم و ڕۆشتمە ژێر ئالآکەی عەمرۆ کوڕی حورەیس. ئەو بەقامچیەکەی خۆی لەروخساری موختاریدا و پێڵوی چاوی ئەوی دڕاند و وتی: ئەگەر شایەتی عەمرۆ نەدەبو، دەمکوشتی. دواتر ئەوی خستە زیندان و لەزینداندا هێشتیەوە تا حسین کوڕی عەلی کوژرا.

دواتر موختار کەسی بۆ لای عەبدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب رەوانە کرد و داوای لێکرد لەبەرژەندی ئەو نێوەنجیگەری بکات. عەبدالله، خوشکی موختار، سەفیە کچی عوبەیدەی وەك هاوسەری هەڵبژاردبو. کوڕی عومەر نامەی بۆ یەزید نوسی و نێوەنجیگەری کرد. یەزید بۆ کوڕی زیاد نامەی نوسی و فەرمانیدا ئازادی بکات.

عوبەیدالله کوڕی زیاد ئازادی کرد و فەرمانی پێدا زیاتر لەسێ ڕۆژ لەکوفەدا نەمێنێتەوە.

موختار بەرو حیجاز بەرێکەوت. کوڕی عێرق لەپشت واقیصە ئەوی بینی. سڵاوی بۆ نارد و پرسی چ بەڵایەك بەسەر چاوی هاتوە. موختار وتی: کوڕی ئەو روسپیە، بەقامچی چاوی هەڵدڕیم و ئەو بەڵام بەسەرهات کە دەیبینی. دواتر وتی: خوا بمکوژێت ئەگەر پەنجەکان و جەستەی ئەو لەت لەت نەکەم. موختار سەبارەت بەکوڕی زوبەیر پرسیاری لێکرد. کوڕی عێرق وتی: ئەو پەنای بۆ ماڵی خوا بردوە و بەنهێنی لەگەڵ خەڵکان بەیعەت دەبەستێت و ئەگەر شکۆ و مەزنی ئەو بەهێز ببێت وپیاوە شەڕکەرەکانی فراوان ببن، شۆڕش دەست پێدەکات.

موختار وتی: ئەو ئەمڕۆ پیاوی پیاوەکانی عەرەبە وئەگەر گوێ لەوتەکانی من بگرێت، کاری فەرمانبەری خەڵکی بۆ بەهێز دەکەم. ئاژاوە هەورتریشقەی لێداوە و تۆفان دەستی پێکردوە وەك بڵێی هەمو شوێنێکی گرتۆتەوە. ئەگەر بیستت من لەشوێنێك بزوتنەوەکەی خۆم دەستپێکرد، بڵێ: موختار هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانان بۆ تۆڵە کردنەوەی خوێنی بەستەم کوژراو، لەقەراغ روبار، شۆڕشی دەسپێکردوە کە سەروەری باوەڕداران و کوڕی کچی پێغەمبەر و کوڕی خەلیفەکەی ئەوان عەلی کوڕی ئەبی تالبە. سوێند بەخوا بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو ئەوەندە کوشتار دەکەم و خوێن دەرێژم کە لەلەبەرابەر خوێنی یەحیا کوڕی زەکەریا خوێن رژایە سەر زەوی.

دواتر بەرێکەوت کە کوڕی عێرق لەوتەکەی ئەو سەریسوڕما. کوڕی عێرق دەڵێت: سوێند بەخوا بینیم ئەوەی هێنایە سەرزمان، بێ کەم و کوری ئەنجامیدا. بەسەرهاتەکەم بۆ حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی گێڕایەوە کە پێکەنی و وتی: چەند بەشکۆ و پیاوێکی چاك بوا دیندار وخۆشکەری ئاگری شەڕ بو، ئەنگی دەسڕیەوە و دوژمنانی بەشمشێرێکی پۆلایین لەناو دەبرد.

دواتر موختار ڕۆشتە لای کوڕی زوبەیر. کوڕی زوبەیر کاروبارەکانی خۆی لەو شاردەوە. موختار لێی جیابویەوە و بۆ ماوەی یەك ساڵ بەدور لەچاوی ئەو ژیانی بەسەر برد. دواتر کوڕی زوبەیر پرسیاری ئەوی کرد. وتیان: لەتاییفە و گومان دەکات هەڵگری تورەیی خواوەند و لەناوبەری ستەمکاران و یاخیانە. کوڕی زوبەیر وتی: چی بەسەر

دێت؟ خوا بیکوژێت! خۆی لەسەرەتاوە وەك پیاوێکی درۆزن دەرکەوت. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەگەر خوا یاخیەکان لەناو ببات، موختار یەکەم کەسی ئەوان نابێت.

ئەو سەرقاڵی ئەم گفتوگۆیە بو کەموختار هاتە ناو مزگەوت و بەدەوری کەعبەدا سوڕایەوە و دو رەکعەت نوێژی خوێند و دانیشت. ئاشناکان لەدەوری کۆبونەوە و گفتوگۆیان لەگەڵ کرد. کوڕی زوبەیر عەباس کوڕی سەهل کوڕی مسعەری بۆ لای ئەو نارد. عەباس ڕۆشتە لای و ئەحواڵی پرسی و دواتر وتی: کەسێکی وەك تۆ دەست لەو پیاوە هەڵناگرێت کە گەورەکانی قورەیش و ئەنسار و سەقیف لەدەوری ئەو کۆبونەتەوە. هیچ هۆزێك نەماوەتەوە مەگەر ئەوەی سەروەرەکەی هاتە لای و بەیعەتی لەگەڵ کرد. موختار وتی: ساڵی پێش ڕۆشتمە لای و ئەو کارەکانی لەمن شاردەوە. کاتێك بێ نیازی خۆی بەمن نیشاندا، منیش ویستم بێ نیازی خۆم بەو نیشان بدەم. عەباس پێی وت: ئەمشەو بڕۆ لای و منیش هاوڕێیەتیت دەکەم. موختار ڕازی بو و لەکاتی تاریك بونی هەوا ڕۆشتە لای. بەکوڕی زوبەیری وت: بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکەم لەسەر ئەو بنەمای هەمو کارەکان بەراوێز کردن لەگەڵ من ئەنجام بدەیت و من یەکەم کەس بم دێمە لای تۆ و کاتێك سەرکەوتیت، لەمن بۆ ئەنجامدانی باشترین کار هاوکاری وەربگریت. کوڕی زوبەیر وتی: لەسەر بنەمای قورئان و شێوازی پێغەمبەر بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستم. موختار وتی: خراپترین کۆیلەکانی منیش لەسەر ئەو بنەمایە بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستن. سوێند بەخوا تەنیا بەو شێوەیە بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستم.

موختار بەیعەتی لەگەڵ کرد و لەگەڵی مایەوە و لەشەڕی حوصەین کوڕی نەمیر بەشداری کرد و ئەزمونێکی چاکەی لەخۆی نیشاندا و بەباشترین شێوە شەڕی کرد. ئەو دوژمنترینی خەڵکان بۆ سەر خەڵکانی شام بو.

کاتێك یەزید کوڕی معاویە مرد و عێراقیەکان بونە فەرمانبەری کوڕی زوبەیر، موختار بۆ ماوەی پێنج مانگ لای ئەو مایەوە و کاتێك بینی کوڕی زوبەیر ئەو وەك فەرمانداری هیچ ناوچەیەك دەستنیشان ناکات، دەستی بەپرسیار کردن لەعێراقیەکان کرد. هیچ کەس لەخەڵکانی کوفە نەدەهاتە لای مەگەر ئەوەی سەبارەت بەبارودۆخی خەڵك پرسیاری دەکرد. هانی کوڕی جەبەی وەداعی ئاگاداری کردەوە کە خەڵکی کوفە بۆ فەرمانبەری لەکوڕی زیاد یەکیان گرتوە. جگە لەدەستەیەك لەخەڵکان کە زۆرترینی

ئەوان و ئەگەر سەرۆکێك بدۆزنەوە، تا لەدەوری کۆببنەوە سەراسەری زەوی دەخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.

موختار وتی: من ئەبو ئیسحاقم. سوێند بەخوا ئەو پیاوە شیاوە منم کە ئەوان لەسەر راستی و دروستی کۆدەکەمەوە و بەهاوکاری ئەوان شەڕ دژی لایەنگرانی چەوتی دەکەم و هەر ستەمکارێك لەناو دەبەم. دواتر سوار چوارپێکەی خۆی بو و بەرەو کوفە بەرێکەوت و رۆژی هەینی گەیشتە روباری حیرە. سەروروخساری شۆرد و جل و بەرگێکی گرانبایی لەبەر کرد ولای مزگەوتی سەکون و گۆڕستانی کێندە تێپەڕی. لەناو هەر کۆڕێك دادەنیشت، سڵاوی بۆ دەناردن و دەیوت: مژدەتان لێ بێت بەسەرکەوتن و رزگاری، ئەوەی دەتانویست، بۆ لای ئێوە هات.

لای بەنی بەدا تێپەڕی کرد و چاوی بەعوبەیدە کوڕی عەمرۆ بەدی لەخەڵکی کێندە کەوت و سڵاوی بۆ نارد و وتی: بۆ رزگاری و سەرکەوتن مژدەت لێ بێت، ئەی باوکی عەمرۆ تۆ هەڵگری ئەندێشەیەکی چاکیت و خوا هیچ گوناحێك بۆ تۆ دیاری ناکات مەگەر ئەوەی بیسڕێتەوە و هیچ هەڵەیەك مەگەر ئەوەی دایبپۆشێت. عوبەیدە لەئازاترینی خەڵکان و بەهێزترینیان لەراستی و دورستی و یەکێك بو لەشوێنکەوتەکانی عەلی. بەڵام لەخواردنەوەی زۆر نەیدەتوانی خۆی بەدور بگرێت. پێی وت: خوا مژدەی چاکەت پێ بدات، ئایا بەراشکاوی قسەمان لەگەڵ دەکەیت؟ وتی: بەڵێ: ئەمشەو وەرە سەردانم.

دواتر لەناو بەنی هند دەستی بەگەڕان کرد و چاوی بەئیسماعیل کوڕی کەسیر کەوت و پێی وت: ئەمشەو هاورێ لەگەڵ براکەت وەرنە لای من چونکە ئەوەی دەتانویست بۆم هێناون. لای خەڵکانی هەمەدان تێپەڕی کرد و وتی: شتێکم بۆهێناون کە شادمانتان دەکات. دواتر رۆشتە ناو مزگەوت و خەڵك لەهەر لایەکەوە لێ کۆبونەوە و دەستیان کردە پاسەوانی چاویان تا سەیری بکەن. لای یەکێك لەستونەکانی مزگەوت وەستا و ئەوەندە نوێژی خوێند تا کاتی نوێژی نیمەڕۆ گەیشت و ئەو نوێژی لەگەڵ خەڵك خوێند و دواتر نوێژی هەینی تا نوێژی ئێوارێی بەجێهێنا و گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و شیعەکان هاتوچۆیان بۆ لای ئەو دەست پێکرد. ئیسماعیل کوڕی کەسیر وبراکەی و عوبەیدە کوڕی عەمرۆ ڕۆشتنە لای. پرسیاری لەوان کرد و لەکارەکانی سولەیمان کوڕی

سورد ئاگاداریان کردەوە و وتیان لەسەر تەختی وتاردانە. سوپاسی خوای کرد و وتی: مەهدی کوڕی جێگری پێغەمبەر منی وەك وەزیر و ئەمین و هەڵبژێردراوی خۆی و هاوشێوەی فەرمانڕەوایەك بۆ لای ئێوە ڕەوانەی کردوە و فەرمانی پێداوم بێ دینەکان کوشتار بکەم و خوازیاری خوێنی بنەماڵەکەی بم و بەرگری لەهەژاران و ناتەوانەکان بکەم. ئێوە یەکەم پیاوان دەبەن کە وەڵامی بانگەوازەکەی من دەدەنەوە.

دواتر دەستیان خستە سەردەستی یەك و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. ئەو کەسی بۆ لای شیعەکان ڕەوانە کرد کە لای سولەیمان کوڕی سورد کۆببونەوە. بەوانی وت: سولەیمان شارەزای کاروباری جەنگ و کەسێکی بەئەزمون نیە بەڵکو دەیەوێت ئێوە بباتەدەر و کوشتارتان بکات. من لەسەر بنەمای ئەو ڕێنوێنیەی بەمنیان بەخشیوە و کاروبارێك کەرێبەر و سەرپەرەستەکەی ئێوە بۆی ڕونکردومەتەوە، هەڵس وکەوت دەکەم و دوژمنەکانتان دەکوژم و دڵی ئێوە ئاسودە دەکەم. گوێ لەوتارەکانی من بگرن، فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن و دواتر بلاَو ببنەوە.

ئەو بەردەوام ئەم کارەی دەکرد و بەم شێوەیە قسەی دەهێنایە سەر زمان تا دەستەیەك لەشیعەکانی پەیوەستی خۆی کرد و ئەوان هاتوچۆیان بۆ لای ئەو دەست پێکرد و بەگەورەیان زانی. گەورەکانی شیعە لەگەڵ سولەیمان کوڕی سورد بون و کەسیان بەگەورەتر لەو نەدەزانی. ئەو دوژمنترین کەسەکان بۆ موختاربو و موختار چاوەڕوانی ئەنجامی کارەکانی سولەیمانی دەکرد.

کاتێك سولەیمان بەرەو جەزیرە بەرێکەوت، عومەر کوڕی سەعد و شەبس کوڕی ڕێبعی و زەید کوڕی حارس کوڕی ڕویەم بەعەبداللە کوڕی یەزیدی حەتەمی و ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحەیان وت: موختار زیاتر لەسولەیمان دوژمن ئێوەیە. ئەو بەرێکەوتوە تا شەڕ لەگەڵ ئێوە دەستپێبکات و موختار دەیەوێت لەناو شارەکەدا هێرش بکاتە سەر ئێوە. بیگرن و بیخەنە زیندان تا کاروبارەکانی خەڵك سامان بدرێت.

ئەوان هاتن و بەشێوەیەکی لەناکاو گەمارۆیاندا. کاتێك ئەوانی بینی، وتی: مەبەستی چیتان هەیە؟ سوێند بەخوا سەرکەوتن بەردەستتان نەکەوتوە! ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە وتی: بەتوندی شانی ببەستەوە و بەپیادە بابڕوات. عەبداللە وتی: من ئەم کارە لەگەڵ پیاوێك ناکەم کە هێشتا زیانی خۆی بۆ ئێمە ئاشکرا نەکردوە. ئێمە لەسەر

بنەمای گومان دەستگیری دەکەین. ئیبراهیم وتی: ئەمە هێلانەی تۆ نیە، ڕێگەی خۆت بگرە بەر. ئەی کوڕی ئەبو عوبەید، ئەم چ کارێکە مەبەستی ئەنجامدانیت کردوە و ئێمەیان لێ ئاگادار کردۆتەوە؟ موختار وتی: تەنیا گومان و قسەی قۆڕ بەرگوێی ئێوە کەوتوە و من لەخیانەت پەنا بۆ خوا دەبەم، لەخیانەتێك هاوشێوەی ئەوەی باوك و باوکانی تۆ کردیان.

دواتر ئەویان بێ زنجیر خستە زیندانەوە. بەمشێوە نەبو بەڵکو بەستیانەوە. ئەو لەزیندان بەردەوام ئەم قسانەی دەهێنایە سەرزمان: سوێند بەپەروەردگاری دەریایی خرۆشان، دارخورماکان و دارەکان، دەشتە بێ کۆتاییەکان و قوڵاییەکانی بیابان وفریشتەکان و هەمو چاکەکاران و هەڵبژێردراوان، بێ چەند و چون هەمو یاخیەکان دەکوژم، بەرم، شمشێری هندی تیژ، بەهاوکاری یاران کە گێژ نین و دورەپەرێز نەوەستاون. کاتێك کۆڵەکەکانی دینم بەهێز کرد و خراپی کاروبارەکانی موسوڵمانانم نەهێشت و دڵی خواپەرستەکان لەتۆڵە فێنك بکەمەوە و داوای خوێنی پێغەمبەرەکان لەدوژمنە کۆنەکان بکەم، ترسم ئەوەم نیە ئەم جیهانە کۆتایی بێت یا ڕێگە بدات مەرگ هێرش بکاتە سەرم.

سەبارەت بەبزوتنەوەکەی موختار وهاتنی بۆ کوفە ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکیتریش داوە. دەڵێن: کاتێك موختار لای کوڕی زوبەیر بو، پێی وت: خەڵکانێك دەناسم کەنەگەر پێشەوایەکی شارەزا لەکاروباری دین و زانستەکانی ئەم دنیا کە بەسەرهاتی ڕۆژگارە دورەکان و ڕوداوەکانی داهاتو بزانێت، لەوان سوپایەك بۆ تۆ ئامادە دەکات کە بەهاوکاری ئەوان دەتوانی شەڕی خەڵکانی شام بکەیت. کوڕی زوبەیر پرسی: کێن؟ موختار وتی: شیعەکانی عەلی لەکوفە. کوڕی زوبەیر وتی: تۆ ئەو پیاوە بە. ئەوی بۆ کوفە ڕەوانە کرد. ئەو هاتە ئەم شارە و لەسوچێکدا ماڵێکی دەستنیشان کرد و بەردەوام بۆ حسین دەگریا و چۆنیەتی کوشتنی ئەوی بیردەهێنایەوە و شینی دەگێڕا. شیعەکان سەردانیان کرد و ئەویان وەك هاوڕێی خۆیان دەستنیشان کرد و دواتر ئەویان هێنایە ناو کوفە و دەستەیەکی زۆر لەخەڵکان هاتوچۆیان دەکرد. کاتێك کاروبارەکانی سەقامگیر و بەهێز بو، بەرەو لای کوڕی موتیع ڕەوانە بو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. کارگوزارەکانی ئەو ئەم کەسانە بون: براکەی عوبەیدە کوڕی زوبەیر لەمەدینە، عەبدالله کوڕی یەزیدی حەتەمی لەکوفە، هشام کوڕی هوبەیرە سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەم شارە، عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی عومەری تەمیمی لەبەسرە و عەبدالله کوڕی خازم لەخوراسان.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: دەستەیەکیان لەناو ئەم ساڵەدا و دەستەیەکیان لەرۆژگاری فەرمانڕەوایی کوڕی زوبەیر یا یەزید کوڕی معاویە لەساڵە جۆراوجۆرەکان بەو شێوەی ئێستا ئاماژەی پێدەدەین: شەداد کوڕی ئەوس کوڕی سابت برازای حسان کوڕی سابت، میسوەر کوڕی مەخریمە لەمەککە لەو رۆژەی هەواڵی مەرگی یەزید گەیشتە ئەم شارە، هۆکاری مردنەکەی ئەوە بو کە لەکاتی شەڕدا، لەتە بەردێك لەبەردهاوێژێکەوە بەر سەری کەوت کە لەزیانەکەی نەخۆش کەوت و دوای چەند رۆژێك مرد. ئەبو بورزەی ئەسلەمی لەخوراسان، وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی سوفیان، ئەبو سەعلەبەی خوشەنی لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی یەزید یا لەساڵی ٦٩٤/٧٥ زایینی، ئەو لەهاوەڵانی پێغەمبەر بو، عایز کوڕی عەمرۆ کوڕی موزنی لەبەسرە، لەو کەسانە بو بەشداری بەیعەتی رضوانی کرد، قەیس کوڕی خەرشە لەهاوەڵانی پێغەمبەر لەرۆژگاری فەرمانڕەوایی کوڕی زوبەیر، هەواڵی مەرگی ئەو لەگەڵ کوڕی زیاد سەرسورهێنەربو چونکە پیاوێك بو بەردەوام لەراستی و دروستی قسەی دەکرد، نەوفل کوڕی معاویە کوڕی عەمرۆ دوئەلی، ئەبو خەیسەمەی ئەنساری کە لەرۆژگاری یەزید مرد، لەشەرکەرانی ئۆحوێد و لەشەڕی تەبوك داستانێکی ناودار سەبارەت بەو هاتەئاراوە، عیتبان کوڕی مالك لەبەدریەکان، لەرۆژگاری یەزید، شەقیق کوڕی سەوری سەدوسی کە لەم ساڵەدا مرد.

## روداوەكانی ساڵی شەست و پێنجی كۆچی ( ٦٨٤ – ٦٨٥ زایینی )

## بزوتنەوەی ئەو كەسانەی بۆ لای خوا گەڕانەوە، كوشت و بڕی ئەوان

كاتێك سولەیمان كوڕی سورد لەساڵی ٦٥/ ٦٨٤- ٦٨٥ زایینی بڕیاریدا بزوتنەوەكەی خۆی ئاشكرا بكات و شەڕ لەرێگەی خوادا دەست پێبكات، كەسی بۆ لای سەركردەی هاورێیانی خۆی رەوانە كرد و بەرەو لای ئەو بەرێكەوتن. كاتێك رۆژی یەكەمی رەبیع الثانی ١٥ نۆڤەمبەری ٦٨٤ زایینی نزیك بویەوە، لەگەڵ سەركردەكانی سوپاكەی خۆی هاتەدەر چونكە ئەو شەوەیان كردبو بەشەوی كۆبونەوە. كاتێك گەیشتە نوخەیلە، بەناو خەڵكدا سوڕایەوە بەلأم ژمارەكەیان بەكەم زانی. حەكیم كوڕی مێنقەزی كێندی و وەلید كوڕی عەصیری كەنانی رەوانە كرد و ئەم دوانە لەكوفەدا جاڕیاندا: ئەی تۆڵەستێنەكانی حسین! ئەوان یەكەم كەسیان بون هاواریان كرد: ئەی تۆڵەستێنەكانی خوێنی حسین كوڕی عەلی!

كاتێك بەرەبەیانی بەیانی گەیشت، ژمارەیەك لەخەڵكان بەئەندازەی سوپاكەی لەدەوری ئەو كۆبونەوە. سەیری دەفتەرەكەی خۆی كرد و ئەوانی بەشانزە هەزار كەس لە بەیعەت كەران خەملأند. وتی: پەنا بەرخوا! لەناو شانزە هەزار كەس كەبەیعەتی لەگەڵ ئێمەدا كردوە، تەنیا چوار هەزار كەس لەدەوری ئێمە كۆبۆتەوە. پێی وترا: موختار خەڵك لەشوێنكەوتنی تۆ دوردەخاتەوە. دو هەزار كەس لەگەڵ ئەو بەیعەتیان كردوە. وتی: لەگەڵ ئەوەیشدا دوانزە هەزار كەس دەمێنێتەوە، ئایا ئەوان خواپەرەست نین؟ ئایا خواوەند و وتەكانی خۆیان و پەیمانەكانیان بیر ناكەوێتەوە؟ سێ رۆژ لەنوخەیلە مایەوە و پەیك و پەیامی بۆ لای خەڵكان رەوانە كرد. نزیكەی هەزار پیاوی شەڕكەر لەدەوری كۆبونەوە. موسەییب كوڕی نەخەبە هەستا و وتی: خوا لێت خۆش بێت! ئەو كەسەی بەنەخوازراو بێت، هیچ سودێك بەتۆ ناگەیەنێت و جگە لەو كەسانەی بەدڵ و گیانەوە هاتون، كەس لەدڵەوە شەڕ ناكات. بۆ هاتنی كەس چاوەڕوان مەبە و لەكارەكەی خۆت بەپەلە بە. وتی: راستت وت.

دواتر سولەیمان لەناو هاوەڵانی خۆی هەستا و وتی: ئەی خەڵكینە، هەر كەس لەم

هاتنەدەرە، خوازیاری ڕەزامەندی خواوەند و پاداشتی ئەو دنیایە، لەئێمەیە و ئێمە لەوین. خوا بیبەخشێت چ زیندوبێت چ مردو. هەرکەس خوازیاری ئەم جیهانەیە، سوێند بەخوا ئێمە بۆ بەدەست هێنانی تالانی نەهاتوین و تەنیا مەبەستمان ڕەزامەندی پەروەردگارە و هیچ زێر و زیو و کالآیەکمان پێ نیە. ئەوەی هەمانە، شمشێرەکانی سەر شانمانە و خواردنێکی کەم کە بۆ بژێوی ڕۆژەکانمان بەسەندە بکات. هەر کەس بۆچون یا مەبەستێکی جیاواز لەمەی هەیە، هاورێیەتی ئێمە نەکات. هاورێکانی هاواریان کرد: ئێمە خوازیاری ئەم جیهانە نین و بۆ ئەو مەبەستە نەهاتوین. هاتوین بۆ لای خوا بگەرێینەوە و داوای خوێنی کوڕی پێغەمبەر بکەین.

کاتێك سولەیمان مەبەستی ڕەوانە بونی کرد، عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل پێی وت: بۆچونێکم هەیە، ئەگەر ڕاست بێت، خوا سەرکەوتنی پێ دەبەخشێت و ئەگەر ناڕاست بێت، لەلایەن منەوە بێت. ئێمە بۆ تۆڵەی خوێنی حسین هاتوین بەلأم بکوژەکانی ئەو لەکوفەن کە کەسانی وەك عومەر کوڕی سەعد و سەرکردەی هۆزەکان لەناو ئەواندان. ئەوان بەجێبێڵین وبۆ کوێ بچین؟ هاورێکانی وتیان: بۆچونی ڕاست ئەمەیە.

سولەیمان وتی: من ئەو بۆچونەم نیە. ئەو کەسەی حسینی کوشت و سوپاکەی بۆ شەڕی ئەو ئامادە کرد و وتی کە حسین لەلایەن منەوە ئەمان نابەخشرێت مەگەر ئەوەی ملکەچی فەرمانەکانی من بێت تافەرمانی خۆم سەبارەت بەو جێبەجێ بکەم، ئەم پیاوە خراپەکارە عوبەیدالله کوڕی زیادە. لەسەر بنەمای پیرۆزی ناوی خواوەند بەرێکەون. ئەگەر خوا ئێوەی بەسەر ئەودا سەرکەوتو کرد، هیوادارم شوێنکەوتن و لەناوبردنی لایەنگرانی بۆ ئێمە ئاسانتر بێت. هیوادار بین خەڵکی شارەکانیتر بەئاشتی و ئارامی و تەندروستی ڕام و دەستەمۆی ئێوە ببن تا هەمو بەشداران لەکوشتنی حسین بدۆزنەوە و ئەوان کوشتار بکەن و کوێرکوێرانە هیچ کارێك ئەنجام نەدەن. ئەگەر لەم ڕێگادا گیان ببەخشن، نابەجێ نیە چونکە لەگەڵ ستەمکاران و پێشێلکەرانی مافی خوایی شەڕتان کردوە و ئەوەی لای خوایە، بۆ چاکان باشترە. من نامەوێت ئێوە کار و شەڕی خۆتان لە بەرابەر کەسانیتر جگە لەو کەسانەی ڕێزی پارێزراوە خواییەکانیان پێشێل کرد، دەست پێبکەن. ئەگەر شەڕ لەگەڵ خەڵکی شارەکەتان بکەن، ئەگەری هەیە پیاوێك ناچار بێت

شمشێر بەروی براکەیدا بەرز بکاتەوە یا خزمێکی خۆی لەناو ببات یا پیاوێك ببینێت کە مەبەستی گیانی ئەمی کردوە. چاکە لەخوا داوا بکەن و بەرێکەون.

عەبداللە کوڕی یەزید پێشنیاری بەسولەیمان کرد کە ئەگەر خۆی و هاورێکانی لەکوفە بمێننەوە، باجی شارۆچکەی (جوخی) پێ دەدەن. ئیبراهیم کوڕی محەممەدیش وتارێکی هاوشێوەی هێنایەر سەرزمان. سولەیمان کوڕی سورد بەم دوانەی وت: چاکەخوازیتان کرد و هەوڵتان بۆ دەبرینی باشترین بۆچونەکاندا. ئێمە لەخواپین وبۆ خوا دەگەرێینەوە. لەخوا دەخوازین ئەندێشمەیەکی بەهێزمان پێ ببەخشێت. ئێستا جگە لەهاتنی ئێوە هیچ مەبەستێکمان نیە. عەبداللە وتی: ئێستا کە بەمشێوەیە، ماوەیەك چاوەڕوان بن تا دەستەیەك لەشەرکەرە ئازاکان بکەمە هاورێی ئێوە تا بەپشت بەستن بەسوپایەکی گەورە شەڕی دوژمنەکەی خۆتان بکەن. ئەوان ئاگادار ببونەوە کە عوبەیداللە کوڕی زیاد هاورێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەشامەوە مەبەستی عێراقی کردوە. بەڵام سولەیمان نەمایەوە. ئێوارێی هەینی پێنج رۆژی یەکەمی رەبیع الثانی ساڵی ٦٥/ ١٠ نۆڤەمبەری ٦٨٤ زایینی بەرێکەوت و گەیشتە دار الاهواز. خەڵکێکی زۆر لەهاورێیەتی ئەو پاشەکشێیان کرد. سولەیمان وتی: حەزم نەدەکرد ئەو کەسانە لەگەڵ ئێوەدا بن، چونکە ئەگەر لەگەڵ ئێوەدا دەهاتن تەنها دەبونە هۆی زیادبونی رەنجەکانی ئێوە و لەبەر ئەمە بو خوا هاتنی ئەوان پەسەند نەکرد و زەوی گیری کردن و بەخشش و لەپێشی خۆی تایبەت کرد بەئێوە.

دواتر بەرێکەوتن تا گەیشتنە سەر گۆڕی حسین کوڕی عەلی. کاتێك گەیشتنە سەر گۆڕەکە، هەمویان پێکەوە هاواریان کرد و کەوتنە سەر زەوی. لەهیچ رۆژێکدا ئەوەندە کەسیان چاو بەگریان نەبینیوە. سڵاویان بۆ نارد و داوای لێخۆشبونیان لێکرد کە هاوکاریان نەکردوە و شەڕیان شان بەشانی ئەو پشت گوێ خستوە. شەو رۆژێك لەوێ مانەوە و گریان و شینیان کرد و سڵاوی خۆشەویستی خۆیان بۆ خۆی و هاورێکانی نارد. لە وتەکانی ئەوان لەسەر گۆڕی حسین ئەمە بو: خوایە خۆشەویستی خۆت پێشکەش بەحسین بکە، بۆ ئەم گیان بەخشەی زادەی گیان بەخش، سوشیانس کوڕی سوشیانس، راستگۆی راستگۆزادە، خوایە تۆ بەشایەت دەگرین کە شوێنکەوتەی ئایینەکەی ئەوان و دوژمنی نەیارەکانی ئەوانین. ئەی خوایە، ئێمە هاوکاری کوڕی پێغەمبەرەکەی تۆمان

نەکرد. بمانبەخشە و لەگوناحەکەمان خۆش ببە و بەتۆبەی ئێمە رازی بە. سلاوی خۆشەویستی بۆ حسین و هاوەلانی بنێرە چونکە ئەوان گیان بەخشەکان و راستگۆکانن. تۆ بەشایەت دەگرین کە شوێنکەوتەی ئایین و مەبەستەکەی ئەوانین. ئەگەر ئێمە نەبەخشیت و لێمان خۆش نەبیت، لەزیانکارانین. سەیر کردنی گۆڕی حسین کوڕی عەلی رق و کینەی ئەوانی زیاد کرد.

دواتر بەرێکەوتن. پێش ئەمە، هەمو پیاوەکان سەریان لەگۆڕەکەی دەسو وەك بلێی مالئاواییان لێدەکرد. خەلك زیاتر لە حجر الاسومد( بەردی ڕەش) لەسەر گۆڕی حسین کۆبونەوە. رویان لەئەنبار کرد. عەبدالله کوڕی یەزید نێردراوێکی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد و چەندین وتاری بیرخستنەوە وەك: ئەی خەلکی ئێمە، شوێن دوژمنەکانتان مەکەون. ئێوە لەناو شارەکەی خۆتان باشترینی خەلکانن. هەر کاتێك دوژمنەکانتان دەستیان بەئێوە بگات، بزانن کە ئێوە ئالای رێنیشاندەری شارەکەی خۆتانن. ئەم کارە ئەوان تەماحکار دەکات تا چاو ببڕنە سەرکوت کردنی ئێوە. ئەی خەلکەکەی ئێمە، ئەگەر ئەوان بەسەر ئێوەدا زال بین، بەردبارانتان دەکەن یا دەتانبەنە سەر ئایینەکەی خۆیان کە ئەگەر ئەم کارە بکەن، هیچ کات رزگارتان نابێت (کهف/١٨/٢٠). ئەی خەلکەکەی ئێمە، دەستەکانی ئێمە لەگەل ئێوەیە و دوژمنەکانی ئێمە دوژمنی ئێوە. هەر کات وتار و کردارمان لەبەرابەر دوژمن یەك بێت، بەسەریاندا سەردەکەوین و هەر کات لەگەل یەك ناتەبا و ناسازگار بین، گەورەییمان لەبەرابەر خراپەکاران بەرەو لاوازی دەڕوات. ئەی خەلکەکەی من، ئامۆژگاریەکانی من لەگوێ بگرن و رێگەی ناسازگاری لەگەل من مەگرنەبەر. کاتێك نامەکەی منتان خوێندەوە، بەرەو لای ئێمە بەرێکەون. سلاو و مالئاوا.

سولەیمان و هاورێکانی وتیان: کاتێك لەناو شارەکەمان بوین، لەم ئەندێشەیە خۆمان بەدور گرت، ئێستا کە بۆ شەڕ لەرێگەی خوا، بڕیارمانداوە، ئەم ئەندێشەیە بەهیچ شێوەیەك راست نیە. سولەیمان کوڕی سورد نامەیەکی بۆ عەبدالله کوڕی یەزید نوسی و وتی: خەلکەکەی هاورێی من شادمانن کە گیانی خۆیان بۆ رێگەی خوا تەرخان کردوە. ئەوان لەگوناحە گەورەکەی خۆیان تۆبەیان کردوە و بۆ لای خوا گەڕاونەتەوە و کارەکانی خۆیان بەو سپاردوە وبەوەی خوا کردویەتی بەچارەنوسی ئەوان، رەزامەندن.

کاتێك نامەکە بە دەستی عەبدالله گەیشت، وتی: ئەم کەسانە بۆ مەرگ ئامادەن. یەکەم هەواڵ کە سەبارەت بەوان دەگات، هەواڵی کوژرانی ئەوانە. سوێند بەخوا هاوشێوەی موسوڵمان و ڕێزداران دەکوژرێن.

دواتر بەئامادەیی بۆ شەڕ کردن بەرێکەوتن و گەیشتنە قرقیسیا. زەفەر کوڕی حارسی کەلابی لەوێ بو و لەترسی ئەوان خۆی لەقەڵایەکدا داشارد و ڕوبەڕوی ئەوان نەبویەوە. موسەییب کوڕی نەخەبە کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد و داوای لێکرد بازارێك دروست بکات تا نیازەکانی خۆیان بکڕن. موسەییب هاتە دەروازەی قرقیسیا و خۆی بەوان ناساند و داوای فەرمانی کرد تا بڕواتە لای زەفەر. هوزەیل کوڕی زەفەر ڕۆشتە لای باوکی و وتی: پیاوێکی خۆش کردار و گەش ڕوخسار بەناو و نیشانی موسەییب کوڕی نەخەبە دەیەوێت بێتە لای تۆ. باوك وتی: کوڕم دەزانی ئەوە کێیە؟ ئەمە سوارەی (خەڵکە سورباوەکەی موزێرە) وسەراسەری ئەوان لەژێر فەرمانی ئەمدان. ئەگەر لەگەورەکانی ئەم خەڵکە دەکەسیان دیاری بکرێت، یەکیان ئەوە. جیاواز لەوە ئەو پیاوێکی دیندار و خواپەرستە. ڕێگەی نیشان بدە. کوڕ ڕێگەی نیشاندا. موسەییب بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە و پێی وت مەبەستی چ کارێکی هەیە. زەفەر وتی: ئێمە دەروازەی شارەکەمان تەنیا لەبەر ئەوە بەست تا بزانین مەبەستی ئێمەتان هەیە یا کەسانیتر. ئێمە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی خەڵکان ناتەوان نین، بەڵام نامانەوێت لەگەڵ ئێوەدا بجەنگین. جیاواز لەوە، باسی چاکەکاری و خواپەرستی ئێوە بەگوێی ئێمە گەیشتوە.

دواتر فەرمانی بەکوڕەکەی دا و ئاردی هێنا. فەرمانیدا کە هەزار درەم و ئەسپێکیان بەموسەییبدا. موسەییب درەمەکەی گەڕاندەوە و ئەسپەکەی هەڵگرت و وتی: ئەگەری هەیە ئەسپەکەم شەل ببێت وپێویستم بەئەسپ بێت. زەفەر بڕێکی زۆر ئارد و نان و ئاڵفی بۆ چوارپێکانی ئەوان نارد بەشێوەیەك خەڵك لەبازار بێ نیاز بون، جیاواز لەو کەسانەی کە قامچی یا جل وبەرگیان دەکڕی.

بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە بەرێکەوتن. زەفەر بۆ ڕەوانە کردنی ئەوان ڕۆشتەدەر و بەسوڵەیمانی وت: لەخەڵکانی شام پێنج سەردار لەگەڵ سوپاکەی خۆیان هاتونەتەدەر: حوصەین کوڕی نەمیر، شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاع، ئەدهەم کوڕی موحریز، جەبەلە کوڕی عەبدالله خەسعەمی و عوبەیدالله کوڕی زیاد. ژمارەی ئەوان فراوان و زیاتر لەدار

و درەختە. ئەگەر دەتانەوێت وەرنە شارەکەی ئێمە، تا دەستەکانمان ببن بەیەك. کاتێك دوژمن بگات، پێکەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەین. سولەیمان وتی: خەڵکەی شارەکەی خۆمان ئەم داوایان لەئێمە کرد، بەڵام ئێمە رازی نەبوین.

زەفەر وتی: ئێستا کە بەمشێوەیە، پێش ئەوان خۆتان بە (عین الوردە) بگەیێنن. ئەمە هەمان سەرچاوەیە. بەشێوەیەك کە دێ و ئاو و هۆکارەکانی ژیان لەبەردەستی ئێوەدا بێت. لەوەی لەنێوان ئێمە و ئێوەدایە، ئاسودە بن. بەناو ماڵەکاندا بڕۆن. سوێند بەخوا هیچ دەستەیەکم لەئێوە رێزدارتر نەبینیوە. هیوادارم پێش ئەوان بکەون. ئەگەر لەگەڵ ئەوان شەڕتان کرد، لەگۆڕەپانێکی کراوە شەڕیان لەگەڵ مەکەن بەشێوەیەك تیر بۆ یەك بهاوێژن و بەشمشێر وڕم لەیەك بدەن. ئەوان بەژمارە لەئێوە زیاترن و دەترسم لەهەر چوار لاوە گەمارۆتان بخەنەسەر. لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری مەکەن، چونکە کوشتارتان دەکەن. لەبەرابەر ئەوان ریز مەبەستن چونکە من پیادەکان لەگەڵ ئێوەدا نابینم بەڵام ئەوان پیادە و سوارەیان لەگەڵدایە کە یەکتر دەپارێزن. بەشێوەی دەستە شەڕکەرەکان و بەئەسپە تێژپێکان هێرشیان بکەنەسەر و لەنێوان باڵەکانی راست و چەپی خۆیان بڵاویان بکەنەوە. روبەروی هەر دەستەیەکی شەڕکەر، دەستەیەك شەڕکەر جێگیر بکەن. ئەگەر هێرش بکرێتە سەر دودەستە، ئەویتر هاوکاری دەکات و قورسایی شەڕ لەسەر شانی هەڵدەگرێت. هەر دەستەیەك بیەوێت، دەتوانێت پێشڕەوی بکات و هەر دەستەیەك بیەوێت، دەتوانێت پاشەکشێ بکات. ئەگەر هەموتان یەك ریز بن و پیادەکان هێرش بکەنە سەر ئێوە و ئێوە بەرگری لەریزەکانی خۆتان بکەن، ریزەکانتان تێکدەشکێت و شکست یەختان دەگرێت. دواتر ماڵئاوایی لێکرد و لەخوا بۆیان پاڕایەوە و ئەوانیش بەهەمان شێوە بەشێوەیەکی چاکە وەسفیان کرد.

تێکۆشەرانە بەرەو عین الوردە بەرێکەوتن و لەرۆژئاوای ئەو ناوچەیە جێگیر بون و پێنج رۆژ مانەوە و پیاوە شەڕکەرەکان و ئەسپەکانی خۆیان حەواندەوە.

خەڵکانی شام هاورێ لەگەڵ سوپاکەی خۆیان گەیشتنە شوێنێك کە تا عین الوردە شەو و رۆژێك رێگا بو. سولەیمان لەناو هاوەڵانی خۆی هەستا و ئاماژەی بەجیهانێکیتردا و هاورێکانی بۆ ڕۆشتن بۆ ئەوێ هاندا و وتی: بەڵێ، دوژمنەکانتان، ئەو کەسانەی شەو وڕۆژ و بەرەنج و دژواری بەدوایاندا دەگەڕان، بۆ لای ئێوە هاتون. کاتێك روبەرویان

دەبنەوە، راست و دروست شەڕ لەگەڵ ئەوان بکەن و خۆڕاگری لەخۆتان نیشان بدەن چونکە خوا هاوڕێی خۆڕاگرانە. نابێت هیچ کام لەئێوە پشت بکاتە دوژمن مەگەر بەو مەبەستەی کە خۆی بۆ شەڕێکی بوێرانەتر ئامادە بکات یا بۆلای یەکێك لەدەستە شەڕکەرەکان بڕوات. هیچ هەلاتوێك مەکوژن، ئازاری بریندارەکان مەدەن و گرفتارەکان مەکەنە قوربانی تیغی شمشێر، ئاگادار بن ئەسیرەکان نەکوژن مەگەر ئەو کەسانەی لەکاتی ئەسیریدا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە پێداگری دەکات. ئەمە، شێوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بو سەبارەت بەو کەسانەی پێشنیاری گەڕانەوە بۆ رێگەی راستی پێدەکردن.

دواتر وتی: ئەگەر من کوژرام، هاوڕێکەم موسەییب کوڕی نەخەبە فەرماندەی ئێوە بێت و ئەگەر ئەو کوژرا، عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل و ئەگەر ئەویش کوژرا، عەبدالله کوڕی وال جێگەی بگرێتەوە و ئەگەر ئەویش کوژرا، ریفاعە کوڕی شەداد. خوا ببەخشێت ئەو کەسەی رێز لەپەیمانەکەی خۆی دەگرێت.

بەدوای ئەوە موسەییبی لەگەڵ چوارسەد کەس رەوانە کرد و پێی وت: بەخێرایی بەرێکەوە تا روبەروی پێشەنگەکانی ئەوان ببیتەوە. بەوپەڕی هێزەوە هێرش بکەرە سەریان. ئەگەر بەمەبەستەکەی خۆت گەیشتیت، چ باشتر وەگەرنە بگەرێرەوە. ئاگاداربە خۆت دانەبەزیت یا فەرمان بەیەکێك لەهاورێکانت بدەیت دابەزێت یا زیاتر لەمەبەست پێشڕەوی بکات مەگەر ئەوەی بۆ ئەم کارە ناچار بن. ئەو شەو و رۆژێك رێگەی بڕی و لەکاتی بەرەبەیان دابەزی. هاورێیانی خۆی بەم لاولادا رەوانە کرد تا هەر کەسێك دەبینین، بیبەنە لای ئەو. پیاوێکی بیابان نشینیان بردە لای. لێی پرسی: نزیکترین سوپا بەئێمە کامەیە؟ وتی: سوپاکەی شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاع کە تەنیا یەك میل لەتۆ دورە. لەنێوان شورەحبیل و حوصەین کوڕی ئەمیر کێشەیەك دروست بو، حوصەین وتی: من سەرکردەی هەموانم و شورەحبیل وتی رازی نیم. ئەم دوانە چاوەڕوانی هاتنی کوڕی زیادیان دەکرد.

موسەییب و هاورێکانی بەخێرایی بەرێکەوتن تا لەسەروی ئەوان دابەزین و بینیان تێکۆشەرانە مەبەستی هێرش کردنیان هەیە. یارانی موسەییب هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی سوپاکەی شام بەشێوەیەك سوپاکەیان تێکشاند و هاورێیانی موسەییب چەندین کەسیان لەوان کوشت و دەستەیەکیان بریندار کرد و چوارپێی فراوانیان

کەوتەدەست. شامیەکان پشتیان کردە سوپاکەی خۆیان و هەڵاتن. یارانی موسەییب تا ئەو جێگەی دەیانتوانی، تالآنیان کۆکردەوە و بەدەستی پڕ بۆ لای سولەیمان گەڕانەوە.

ئەم هەواڵە بە کوڕی زیاد گەیشت. ئەو حوصەین کوڕی نەمیری رەوانە کرد کە بەخێرایی بەرێکەوت و هاورێ لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەر لەروبەروی هاورێیانی سولەیمان دابەزی. هاورێیانی سولەیمان چوار رۆژ بۆ کۆتایی جەمادی الاول /٨ ژانویەی ٦٨٥ زایینی روبەروی بونەوە. فەرماندەی باڵی چەپی ئەوان موسەییب کوڕی نەخەبە بو و فەرماندەی باڵی راست عەبداللە کوڕی سەعد و لەناو دڵی سوپا سولەیمان کوڕی سورد. حوصەین فەرماندەی باڵی راستی خۆی بە جوملە کوڕی عەبداللە سپارد و فەرماندەی باڵی چەپ لەئەستۆی رەبیعە کوڕی موخاریقی غەنەوی بو. کاتێك لەیەك نزیك کەوتنەوە، شامیەکان پێشنیاری بەیعەت کردن لەمەروان کوڕی حەکەمیان پێدان و هاورێیانی سولەیمان داوایان لەوان کرد عەبدولەلیك لەسەر کار لاببەن و عوبەیداللە کوڕی زیاد تەسلیمی ئەوان بکەن. دواتر ئەوان کوڕی زوبەیر لەعێراق دەردەپەڕێنن و فەرمانڕەوایی بەیەکێك لەبنەماڵەی پێغەمبەر دەسپێرن. هەردولای شەڕکەر، پێشنیارەکانی یەکیان پشت گوێ خست. لەم کاتەدا باڵی راستی سوپای سولەیمان هێرشی کردە سەر باڵی چەپی حوصەین و باڵی چەپ هێرشی کردە سەر باڵی راست. سولەیمان لەناوەڕاستی سوپاکەیەوە هێرشێکی سەراسەری دەست پێکرد. شامیەکان ناچار بەپاشەکشێ کران. سەرکەوتن هاورێی یارانی سولەیمان بو تا شەو داهات.

کاتێك بەیانی بویەوە، سوپایەکی پێکهاتو لەهەشت هەزار پیاوی شەڕکەر بەسەرکردایەتی کوڕی زی ئەلکەلاع، پەیوەستی سوپاکەی حوصەین بون. کوڕی زیاد ئەوانی بۆ هاوکاری حوصەین رەوانە کردبو. هاورێیانی سولەیمان روبەرویان بونەوە و بەدژواری شەڕیان کرد بەشێوەیەك شەڕێکی لەوە دژوارتر نەبینراوە. کاتێك شەو داهات، لەیەك جیابونەوە. بریندارەکان لەناو ئەوان زیادی کرد. وتاردەران لەناو سوپاکەی سولەیماندا دەگەڕان و ئەوانیان بۆ شەڕ هاندەدا.

کاتێك خەڵکانی شام شەویان کردە بەیانی، ئەدهەم کوڕی موحرزی باهلی لەگەڵ دە هەزار شەڕکەر لەلایەن کوڕی زیاد بۆ هاوکاری ئەوان هات. رۆژی هەینی تا کاتی بەرزبونەوەی خۆر بۆ بەرزترین ئاست، شەڕیان کرد. ژمارەی خەڵکانی شام لەوان زیاتر

بو و لەهەر لایەکەوە هێرشیان دەستپێکرد. سولەیمان بینی هاورێکانی کەوتونەتە چ تەنگانەیێکەوە. لەئەسپەکەی دابەزی و هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا، هەرکەس دەیەوێت بەیانی بەدیداری خواوەند شاد بێت، لای من کۆببێتەوە. دواتر کالآنی شمشێرەکەی خۆی شکاند. دەستەیەکی فراوان لەدەوری کۆبونەوە و کالآنی شمشێرەکانی خۆیانیان شکاند و شان بەشانی ئەو شەڕیان دەست پێکرد. کوشتارێکی بێ وێنەیان لەناو خەڵکانی شام خستەگەر و دەستەیەکی فراوانیان لەوان بریندار کرد و بەردەوام هێرشیان دەکردە سەریان. کاتێك حوصەین پێداگری و خۆڕاگری ئەوانی بینی، پیادەکانی رەوانە کرد تا تیربارانیان بکەن. سوارەکان و پیاوە شەرکەرەکان ئەوانیان گەمارۆدا. سولەیمان کوژرا. یەزید کوڕی حوصەین تیری بۆ هاویشت و لەزیانەکەی سولەیمان کەوتە سەرزەوی و هەستایەوە و دوبارە کەوتە سەر زەوی.

کاتێك سولەیمان کوژرا، موسەییب کوڕی نەخەبە ئالآکەی هەڵگرت و داوای بەخششی بۆ سولەیمان کرد و ئەم ئایەی خوێندەوە: دەستەیەك لەوان بەرێگای خۆیاندا رۆیشتن و دەستەیەك چاوەڕوانی هاتنی فەرمانی خواییان دەکرد بەلآم هەرگیز فەرمودەکانی خوایان نەگۆڕی(احزاب/۲۳/۲۲) ئەو دەستە لەخەڵکانی ئەزد کە لەگەڵ ئەودابون، دەوریان گرت. لەم کاتەدا سێ سوارە لەسەعد کوڕی حوزەیفە گەیشتنە لای ئەوان و ئاگاداریان کردنەوە کە سەد و حەفتا پیاوی شەرکەر بۆ هاوکاری ئەوان هاتون. هەروەها ئاگاداریان کردنەوە کە سێسەد کەس لەخەڵکانی بەسرە بەفەرماندەی موسەنا کوڕی موخەریبە بەمەبەستی هاوکاری کردنی ئەوان بەرێکەوتون. خەڵك لەم هەوالآنە شادمان بون. عەبدالله کوڕی سەعد وتی: ئەمە کاتێك سودی دەبێت کە بەزیندویی ئێمە ببینن.

کاتێك نێردراوەکان بینیان براکانیان لەخاك و خوێندا گەوزاون، خەمبار بون و یەك زمان وتیان: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/ ۲/ ۱۵٦). ئەوان شەڕیان دەست پێکرد. عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل کوژرا. برازاکەی رەبیعە کوڕی موخاریق ئەوی کوشت. خالید کوڕی سەعد هێرشی کردە سەر بکوژی براکەی و بەشمشێر لێیدا. هاورێکانی هاتن و لەبەر زۆری لەدەستی خالید رزگاریان کرد و خالیدیان کوشت. ئالآکە بێ خاوەن مایەوە و کەس نەبو لەژێر ئالآکە شەڕ دەست پێبکات. عەبدالله کوڕی والیان بانگ کرد و بینیان ئەو هاورێ لەگەڵ دەستەیەك، ئاگری

شەڕ خۆش دەکات. ریفاعە کوڕی شەداد هێرشی کردە سەر شامیەکان و ئەوانی تێکشکاند و دەستەیەکی زۆری لەوان کوشت و جیهانی لەوان پاك کردەوە. ئەو هات و ئالاًکەی هەلگرت و ماوەیەك شەڕی کرد و دواتربەهاوەلاًنی خۆی وت: هەر کەس خوازیاری شێوەیەك لەژیانە کەدوای ئەوە مەرگێك لەئارادا نەبێت و ئارامشێك کە رەنجی بەدواوە نەبێت و روخسارێکی شادمان کە خەم برینداری نەکات، دەبێت لەرێگەی شەڕ کردن لەگەلٚ پێشێلکەرانی فەرمانی خواوەند، خۆی لەخوا نزیك بکاتەوە و بەرەو بەهەشت بەرێکەوێت. ئەم لەکاتی نوێژی ئێوارێ بو. خۆی و هاورێکانی هێرشیان بردو دەستەیەکیان کوشت وپاشەکشێیان پێکردن.

دواتر خەلکانی شام لەهەر لایەکەوە هێرشیان کرد تا ئەوەی بۆ شوێنی یەکەمی خۆیان پاشەکشێیان بەمان کرد. تەنیا لەیەك شوێنەوە خەلکانی شام دەیانتوانی دەست بەسەر شوێنەکەی ئەواندا بگرن. کاتێك شەو نزیك کەوتەوە، ئەدهەم کوڕی موحریزی باهلی سەرپەرەستی کاروباری شەڕی گرتە ئەستۆ. ئەو هاورێ لەگەلٚ سوار و پیادەکانی خۆی هێرشی کردە سەر ئەوان. کوڕی موحریز گەیشتە کوڕی وال کە ئەم ئایەی دەخوێند: هەرگیز گومان مەکە ئەوانەی لەرێگای خوادا دەکوژرێن، مردوان بن، بەلکو ئەوان زیندوانن و لای خواوەند رۆزی دەخۆن (ال عمران/ ٢/١٩٦). ئەم وتەیە، ئەدهەم کوڕی موحریزی تورە کرد و بەشمشێر هێرشی کردە سەر عەبداللە کوڕی وال و دەستی ئەوی قرتاند و دواتر لێی دورکەوتەوە و وتی: گومان دەکەم ئارەزوت دەکرد ئێستا لای کەسەکانت بیت. کوڕی وال وتی: قێزەونە گومانەکەی تۆ. سوێند بەخوا حەزم نەدەکرد دەستی تۆ بەجەستەتەوە بێت مەگەر ئەوەی بەئەندازەی دەستم پاداشتم هەبێت تا جەزای من فراوان و سزای تۆ سەنگین ببێت. ئەو لەم وتەیە زیاتر تورە بو و هێرشی کردە سەر کوڕی وال و کوشتی. کوڕی وال وەك کێو لەشوێنەکەی خۆیدا وەستابو و هەولێدەدا بەبێ دەست دوژمنەکەی لەناو ببات. کوڕی وال یەکێك بو لەخۆپارێزەکان.

کاتێك کوژرا، رۆشتنە لای ریفاعە کوڕی شەدادی بەجلی و وتیان: دەبێت ئالاًکە هەلگریت. وتی: ئێمە دوا بخەن ئەگەری هەیە خوا ئێمە بۆ زیان گەیاندن بەوان بپارێزێت. عەبداللە کوڕی عەوف کوڕی ئەحمەر وتی: ئەگەر پاشەکشێ بکەیت، ئەوان زیاتر بوێر دەبن و یەك فەرسەخ ناڕۆین کە تا دوایین کەس دەکوژرێین. ئەگەر کەسێك

لەئێمە رزگاری بێت، عەرەبەکان دەیگرن و بەئەشکەنجە دەیکوژن و لەم رێگەوە خۆیان لەخەڵکانی شام نزیك دەکەنەوە. خۆر بەرەو ئاوابون دەڕوات، ئێمە سوارە شەریان لەگەڵ دەکەین و کاتێك تاریکی باڵ بەسەر هەمو شوێنێکدا بکێشێت، سوار ئەسپەکانی خۆمان دەبین و تا بەرەبەیان بەنەرمی رێگە دەبڕین، هەر کەس هاوڕێ و بریندارەکانی خۆی هەڵبگرێت و سەرئەنجام ئەو رێگە دەدۆزینەوە کەدەبێت بیگرینەبەر. ریفاعە وتی: راست دەکەیت، ئالاَکەی هەلگرت و بەهەمو هێزیەوە شەڕی دژی شامیەکان دەست پێکرد. شامیەکان هەوڵیاندا پێش تاریك بون ئەوان لەناو ببەن بەلاَم سەرکەوتو نەبون چونکە ئەوان خۆڕاگرانە درێژەیان بەشەڕ کردن دەدا. عەبداللە کوڕی عەزیزی کەنانی پێشڕەوی کرد و شەڕی لەگەڵ شامیەکان دەست پێکرد و لەم کاتەدا کوڕە منالّەکەی محەممەد لەگەڵیدابو. هاواری لەبەنی کەنانە لەشامیەکان کرد و کوڕەکەی بەوان سپارد تا بیبەنە کوفە. دواتر پێشنیاری ئەمانیان پێدا کە رازی نەبو و شەڕی کرد تا کوژرا.

کەرب کوڕی یەزیدی حەمیری لەکاتی ئێوارێ لەگەڵ سەد شەڕکەر لەهاورێکانی پێشڕەوی کرد و سەرسەرختانە شەڕی کرد. کوڕی زی ئەلکەلاعی حەمیر پێشنیاری ئەمانی بەخۆی و هاورێکانی کرد. وتی: ئێمە لەجیهان ئەمان بەخشراو و ئاسودە بوین و تەنیا لەبەر ئەوە هاتوین تا ئەمانی ئەو دنیا بەدەست بێنین. شەڕیان کرد تا کوژران. دواتر صەخر کوڕی هیلالی موزنی لەگەڵ سی کەس لەبەنی موزینە هێرشی برد و شەڕی کرد تا کوژرا و هاورێکانی لەگەڵ ئەو کوژران.

کاتێك رۆژیان گەیاندە شەو، خەڵکانی شام بۆ لەشکرگەکەی خۆیان گەڕانەوە. ریفاعە بەناو بریندارەکاندا گەڕا تا بزانێت چ کەسانێك ئەسپەکانی خۆیان لەدەست داوە. هەمویانی بەخەڵکەکەیان سپارد تا پارێزگاریان لێ بکەن. دواتر شەوانە خەڵکی رەوانە کرد و خوی لەگەڵیان بەرێکەوت. حوصەین کوڕی نەمیر لەکاتی بەرەبەیان هەستا تا شەڕیان لەگەڵ بکات بەلاَم ئەوانی نەبینی. ئەو شوێن ئەوان نەکەوت. ئەوان رۆشتن تا گەیشتنە قرقیسیا. زەفەر کوڕی حارسی کەلابی پێشنیاری پێکردن لەوێ بمێننەوە. ئەوان بۆ ماوەی سێ رۆژ مانەوە. زەفەر میوانداری ئەوانی کرد و دواتر خوراردن و توێشوی پێدان. ئەوان بۆ کوفە گەڕانەوە.

دواتر سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان لەگەڵ خەڵکانی مەداین بەرێکەوت تاگەیشتە

هیت. ئاگاداریان کردەوە. ئەو گەڕایەوە و موسەنا کوڕی موخریبەی عەبدی لەگەڵ خەڵکانی بەسرە لە (صندودا ) بینی و ئەوانی ئاگادار کردەوە. ئەوان چاوەڕوانیان کرد تا ریفاعە گەیشت. پێشوازیان لێکرد. هەمویان پێکەوە دەستیان بەگریان و شین کرد. شەو رۆژێك مانەوە و دواتر بلاوەیان لێکرد و هەرکەس بەرەو شارەکەی خۆی بەرێکەوت.

کاتێك ریفاعە گەیشتە کوفە، موختار لەزینداندا بو. پەیامی بۆ نارد: دوای سلاو، ئافەرین بۆ ئەو دەستەی کە خوا پاداشتی گەورەی خۆی بەوان بەخشی تا گەڕانەوە و کاری ئەوانەی پەسەند کرد تا کوژران. سوێند بەخوای کەعبە، هیچ کام لەئێوە هەنگاوێکی هەڵنەگرتوە و نەڕۆشتۆتە سەر تەپۆلکەیەك مەگەر ئەوەی پاداشتی خوایی، گەورەتر لەهەمو ئەم جیهانە، بەو بەخشرابێت. سولەیمان ئەرکی سەرشانی خۆی پیاوانە جێبەجێ کرد تا خوا ئەوی بۆ لای خۆی بردەوە. خوا رۆحی ئەو لەگەڵ رۆحی پێغەمبەرکان شاد بکات. ئەو کەسێك نەبو بتوانێت رێبەرایەتی و فەرماندەیی ئێوە لەدەست بگرێت. من فەرماندە و فەرمانبەر، بەهێز و ئەمان پێ بەخشراو و بکوژی ستەمکارەکان و تۆڵەستێن لەدوژمنانی دین لەم رۆژە و لەرۆژی کۆتایی و خوازیاری خوێنە پاکەکان لەرۆژی شەڕ و شوێنکەوتەی پێغەمبەر لەهەر کردار و ئاکارێك و خوازیاری تۆڵەسەندنەوە لەشەیتانە خراپەکارەکان و بەرگریکاری هەژاران و گرفتارانی رۆژگار و شەڕکەر لەگەڵ پێشێلکەرانی ئایینی راستیم. سلاو و ماڵئاوا.

کوژرانی سولەیمان و هاورێکانی لەمانگی ربیع الثانی/ نۆڤەمبەری ٦٨٥ زایینی بو.

کاتێك عەبدولەلیك لەکوژرانی سولەیمان و هاورێکانی ئاگادار بویەوە، ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی: دوای سلاو، خواوەند لەناو عێراقیەکان، سەرکردەی ئاژاوەچیەکان و رێبەری گومڕاکان سولەیمان کوڕی سوردی لەناوبرد و شمشێرەکان سەر و جەستەی موسەییب کوڕی نەخەبەیان بەلەت وپەتی لەسەر زەوی بەجێهێشت. خوا دو سەرکردەی گەورەی ئەوانی لەناو برد، دو گومڕای گومڕاکەر: عەبدالله کوڕی سەعدی ئەزدی و عەبدالله کوڕی والی بەکری. دوای ئەوان کەس نەماوەتەوە بتوانێت پارێزگاری لەخۆی بکات یا لەپەنای کەسانیتر جێگە بگرێت.

ئەمە راست نیە چونکە باوکی ئەو زیندو بو.

ئەعشی هەمەدان سەبارەت بەم روداوە ئەم شێعرەی هۆنیوەتەوە: ئەمە لەو قەسیدانەیە بەردەوام ئەو رۆژانە بیر دەخاتەوە:

و ما زلت فی شجو و ما زلت مقصدا　　لهم عرانی من فراقك ناصب
فما انس لا انس انفتالك فی الضحی　　الینا مع البیض الحسان الخراعب
تراءت لنا هیفاء مهضومة الحشا　　لطیفة طی الکشح ریا الحقائب
مبتلة غراء رود شبابها　　کشمس الضحی تنکل بین السحائب
فلما تغشاها السحاب و حوله　　بدا حاجب منها و ضنت بحاجب
فتلك الهوی و هی الجوی لی والمنی　　فاحبب بها من خلة لم تصاقب
و لا یبعد الله الشباب و ذکرة　　و حب تصافی المعصرات الکواعب
و یزداد ما احببته من عتابنا　　لعابا و سقیا للخدین المقارب
فانی و ان لم انسهن لذاکر　　رزیئة مخبات کریم المناصب
توسل بالتقوی الی الله صادقا　　و تقوی الاله الله الرفیع المراتب
تخلی عن الدنیا و قال اطرحتها　　فلست الیها ما حییت بایب
و ما انا فیما یکره الناس فقده　　و یسعی له الساعون فیها براغب

المناصب

فوجهة نحو الثویی سائرا　　الی ابن زیاد فی الجموع الکتائب
بقوم هم اهل التقیة و النهی　　مصالیت انجاد سراة مناجب
مضوا تارکی رای ابن طلحة حسبة　　و لم یستحیبوا للامیر المخاطب
فساروا و هم ما بین ملتمس التقی　　و اخر مما جر بالامس تائب
فلا قوا بعین الوردة الجیش فاصلا　　الیهم فحسوهم ببیض قواضب
یمانیة تذری الا کف و تارة　　بخیل عتاق مقربات سلاهب
فجاءهم جمع من الشام بعده　　جموع کموج البحر من کل جانب
فما برحوا حتی ابیدت سراتهم　　فلم ینج منهم ثم غیر عصائب
و غودر اهل الصبر صرعی فاصبحوا　　تعاورهم ریح الصبا و الجنائب
فاضحی الخزاعی الرئیس مجدلا　　کان لم یقاتل مرة و یحارب

و راس بنی شمخ و فارس قومه — شنوءة و التميمی هادی الكتائب

و عمرو بن بشر والوليد و خالد — و زيد بن بكر و الحليس بن غالب

و ضارب من همدان كل مشيع — اذا شد لم ينكل كريم المكاسب

و من كل قوم قد اصيب زعيمهم — وذو حسب فی روة المجد ثاقب

ابو اغير ضرب يفلق الهام وقعه — و طعن ثاطراف الا سنة صائب

و ان سعيدا يوم يدمر عامرا — لا شجع من ليث بدرب مواثب

فيا خير جيش بالعراق و اهله — سقيتم روايا كل اسحم ساكب

فلا يبعدن فرساننا و سراتنا — اذ البيض ابدت عن خدام الكواعب

وما قتلوا حتى اثاروا عصابة — محلين نورا كالشموس الضوارب

یانی: لەئێمەوە سلاو لەتۆ بێت، هەرچەندە دڵدارێکی دورەپەرێزیت. من بەردەوام گیرۆدەی خەمێکی سوتێنەر و نیشانەی داغێکی ئاشکرا بوم کە لەدوری تۆ، ئاگری بەردایە گیانم. هەر شتێك لەبیر بکەم، ئەمە لەبیر ناکەم کە لەکاتی نیمەڕۆ مەبەستی ئێمەت کرد و هاورێ لەگەڵ کیژە سپیەکان و سیمین جەستەکان و جوان و روخۆشەکان، خۆت فرێدایە ئامێزی ئێمە. ئەو بۆ ئێمە هاوشێوەی ئەندام بارێکیك بەخاڵیگەی ئاسکەوە دەرکەوت کە ئەم لاولای کەلەکەی تەخت بو و سمتێکی تەڕ و شادان. لەکەسانیتر دابڕا بو و پەیوەستی دۆست ببو. گەنجیەکەی تەڕوتازە بو. وەك خۆری نیمەڕۆ کە لەپشت هەورەکانەوە دەرکەوێت، لەناو جوان روخسارەکان دەدرەخشایەوە. کاتێك هەورەکان ئەو و دەوروبەریان داپۆشی، برۆیەکی کەمێك نیشاندا و برۆکەیتری لێ شاردینەوە. ئەوە دڵدانە، شەیداییە، داخ و سوتانە، ئارمانە. هاورێیەتیەکەی هەمیشە ئەمر بێت کە پاك و بێ گەردە و جگە لەپاکی و خۆشەویستی، تێکەڵاو بەهیچ شتێکیتر نیە. خوا گەنجی و بیری ئەو دور نەخاتەوە، نزیك بێت هاوپیاڵە بون لەگەڵ ئەو گوڵ روخسارانەی گەشتونە رۆژگاری گەنجی و مەمکی رەق و نەرم و سەختیان قوت کردۆتەوە. هەرچەندە زیاتر خۆشم بوێت، گلەیی زیاتر لەیەك دەکەین، ئاوی دەمی دەبارێت هاوشێوەی ساردەمەنیەك و یاران تێراو دەکات. هەرچەند من ئەو مانگ روخسارانە لەبیر ناکەم، پرسەی چاو بەفرمێسکێك بۆ دەرگای خواوەند بەردەوام بیردێنمەوە کەپێگە بەرزەکانی هەیە. راستگۆیانە خواپەرستی و خۆپارێزی هەڵبژارد،

خۆپارێزی باشترین خەلآتی هەر مامڵەیەکە. چاوی لەم جیهانە پۆشی و خۆی تێکەلآو نەکرد و وتی: فرێمدا، تا ئەو کاتەی زیندوم، بۆ لای ناگەڕێمەوە. بۆ ئەوەی خەڵك لەدەست دانی بەدژوار و ناخۆش دەزانن و هەوڵدەران هەوڵی بۆ دەدەن، خوازیار نیم. ئەوی بۆ لەشکرگە ڕەوانە کرد و ئەو بەرێکەوت و ڕوبەڕوی دەستە شەڕکەرەکانی کوڕی زیادی ڕوسپی بویەوە. لەگەڵ خەڵکانێك کە هەمویان خواوەندەکانی خۆپارێزی، بوێرەکان، تێکۆشەران بۆ نیازەکانی خەڵك، کۆچکەران بۆ ئەو ڕێگەی کەسانێتر بێزار دەکات، سەروەران و فەرزانە ناودار و شیاوەکان. بەرێکەوتن و بۆچونی کوڕی تەڵحەیان پشت گوێ خست و گوێیان لەفەرمانداری بێگانە نەگرت. بەرێکەوتن، دەستەیەکیان بەدوای خۆپارێزیدا دەگەڕان و دەستەیەك لەوەی دوێنێ ئەنجامیاندابو، بەدەم گریانەوە پەنایان بۆ خوا دەبرد. (لەسەرچاوەی گوڵ) ڕوبەڕوی سوپایەکی گەورە بونەوە کە هێرشی دەکردە سەر ئەوان، شمشێرە بڕەڕەکانیان بەدەستەوە گرت و ڕوبەڕویان بونەوە. تیغی تیژی یەمانیان پێبو کە دەستی پاڵەوانانی وەك گەڵای دارەکان دەرژاندە سەر زەوی، هەندێ کاتیش سوار لەسەر باشترین ئەسپەکان، نزیك لە زان بەکەمەر و پشتی درێژ و خەرامان سوار دەبون و شەڕیان دەکرد. دەستەیەکی فراوان لەخەڵکانی شام هێرشیان کردە سەر ئەوان و دوای ئەوان دەستەکانیتر هاتن و هاوشێوەی شەپۆڵەکانی دەریایی خرۆشاو، لەهەر لایەکەوە گەمارۆیان دان. خۆر هەڵنەهاتبو کە خەڵکانی شامیان کوشتار کرد وگەورەکانیان کەوتە سەر زەوی و لەدار و دەستەی خراپەکاران تەنیا دەستەیەکی کەمیان ڕزگاری بو. پیاوە خۆڕاگرەکانیان لەسەر زەوی و لەناو خوێندا بەجێهێشت و ئەوان بەشێوەیەك لەگەڵ خاکدا تەخت بون کە باکانی سەرو و باکانی خوارەوە بەسەر ئەواندا هەڵیانکرد. خوزاعی سەرکردە لەت لەت بو، وەك بڵێی هەرگیز شەڕ و جەنگێك ڕوینەداوە. سەرکردەی بەنی شەمخ و سوارەی خەڵکەکەی خۆی شنوئە، تەمیمی، سەرداری دەستە شەڕکەرەکان، عەمرۆ کوڕی بشر، وەلید، خالد، زەید کوڕی بەکر و حولەیس کوڕی غالب. لەهەمەدان، بکوژی هەر شەڕکەرێك کەهێرش بێنێت، ناگەڕێتەوە و کاتێك ببەخشێت، شەڕکەران بێزار دەکات. لەهەر خەڵکێك، سەرۆکەکانیان گیانیدا. نەژادێك لەسەر لوتکەی سەروەری وەك ئەستێرەیەکی سەردەرهێناو لەکەنارەکانی ئاسمان. جگە لەوەیان پەسەند نەکرد کە شمشێر لەسەرەکان بدەن و بیانکەن بەدو کەرت

و بە ڕمە گیان ستێنەکان، بکەونە گیانی پاڵەوانەکان. سەعید لەو ڕۆژەی دوژمنی لەناو دەبرد، لەهەر بوێرێك لەدەروازەکانی چاکەکاری، پیاوەتی و جوامێری پێش کەوت. ئەی باشترین شەڕکەرانی عێراق، ئەی باشترینی خەڵکان، خۆزگە هەمو هەورە خرۆشاو و بارانزاکان، گۆڕەکانتان تەڕ و تێراو بکات. سوارەکان و پاسەوانەکانی ئێمە دور نەبن. کاتێك دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان، پاوانەی کیژە مەمك هەنارەکان دەردەخات. نەکوژران تا ئەوەی دەستەیەکی زۆر لەخەڵکانیان هاندا کەوەك تیشکی هەتاو دەڕۆشتنە ناو هەر دەلاقەیەکەوە.

دەستەیەك دەڵێن: سوڵەیمان و هاورێکانی لەمانگی ڕەبیع الاول/ ئۆکتۆبەری ٦٨٥ زایینی کوژران.

ناوەکانی ناو قەسیدەکە:

خوزاعی: مەبەست لێی سوڵەیمان کوڕی سوردی خوزاعیە.

سەرکردەی بەنی شەمخ: مەبەست لێی موسەییب کوڕی نەخەبەی فەزاریە.

سەرکردەی شنوئە: عەبدالله کوڕی سەعد کوڕی نوفەیلی ئەزدی.

تەمیمی: عەبدالله کوڕی والی تەمیمی لەتیم الات کوڕی سەعلەبە کوڕی عوکابە کوڕی صەعب کوڕی عەلی کوڕی بەکر کوڕی وایلە.

وەلید: کوڕی عەصیری کەنانیە.

خالد: خالد کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل برای عەبدالله کوڕی سەعد.

## بەیعەت لەگەڵ عەبدولمەلیك كوڕی مەروان و عەبدولعەزیز كوڕی مەروان وەك جێگری خەلیفە

لەم ساڵەدا مەروان كوڕی حەكەم فەرمانیدا كە بۆ دو كوڕەكەی عەبدولمەلیك و عەبدولعەزیز وەك جێگری خەلیفە لەخەڵك بەیعەت وەربگرن.
هۆكاری ئەم كارە ئەوە بو كە كاتێك عەمرۆ كوڕی سەعید كوڕی عاص بەسەر مەصعەب كوڕی زوبەیر سەركەوت ( لەو كاتەی عەبداللەی برای ئەوی بۆ فەلەستین رەوانە كرد)، هاتە دیمەشق و مەروانی بینی كە دەستی بەسەر میسر و شامدا گرتوە. مەروانیان ئاگادار كردەوە كە عەمرۆ بەردەوام دەڵێت: دوای مەروان من فەرمانڕەوایی دەگرمە دەست. مەروان، حسان كوڕی مالك كوڕی بەجدەلی بانگ كرد وئاگاداری كردەوە كە دەیەوێت بۆ دوكوڕەكەی عەبدولمەلیك و عەبدولعەزیز بەیعەت وەربگرێت و ئەمە لەدوای ئەو وتارانەیە كە لەعەمرۆ بەگوێی گەیشتوە. حسان وتی: من عەمرۆ كوڕی سەعید بۆ تۆ بێدەنگ دەكەم. كاتێك خەڵك شەوانە لای مەروان كۆبونەوە، حەسان هەستا و وتی: ئاگاداریان كردوین كەدەستەیەك لەخەڵكان ئارەزوی سەیر لەسەردا پەروەردە دەكەن. هەستن و بۆ فەرمانبەری لە عەبدولمەلیك و دوای ئەو لە عەبدولعەزیز بەیعەت بدەن. هەمویان هەستان و بەیعەتیان كرد.

## رەوانە كردنی كوڕی زیاد و حوبەیش

لەم ساڵەدا مەروان دو لەشكركێشی رێكخست: یەكیان بەعوبەیداللە كوڕی زیاد بۆ جەزیرە بۆ شەڕ لەگەڵ زەفەر كوڕی حارس لەقرقیسیا. عوبەیداللەی كردە فەرمانڕەوای تەواوی ئەو ناوچانەی كەدەستی بەسەردادەگرێت. فەرمانی پێدا كاتێك لەجەیزرە تەواو بو، رو لەعێراق بكات وئەو ناوچەیە لەكوڕی زوبەیر بستێنێتەوە. ئەو كاتەی لەجەزیرە بو، هەواڵیان پێدا كە مەروان مردوە. نامەی عەبدولمەلیكی پێگەیشت كە ئەوی بۆ سەر ئەوەی باوكی فەرمانی پێدابو، دەستینشاندەكردو داوای دەكرد لەڕۆشتن بۆ عێراق پەلە بكات.
لەشكركێشیەكیتر بەسەركردایەتی حوبەیش كوڕی دەلجەی قینی بۆ مەدینە بو. ئەو سوپاكەی خۆی بۆ مەدینە برد. فەرمانداركەی لەلایەن كوڕی زوبەیر: جابر كوڕی

ئەسوەد كوڕی عەوف برای عەبدولرەحمان كوڕی عەوف بو. جابر هەڵات.

دواتر حارس كوڕی ئەبی رەبیعە، برای عەمرۆ كوڕی ئەبی رەبیعە، لەشكرێكی لەبەسرەوە رەوانە كرد. ئەو فەرمانداری بەسرە لەلایەن كوڕی زوبەیر بو. فەرماندەیی ئەم سوپایەی بە حونەیف كوڕی ئەحفی تیمی سپارد و فەرمانی پێدا روبەروی حوبەیش ببێتەوە و شەڕی لەگەڵ بكات. كاتێك حوبەش ناوبانگی ئەم سوپای بیست، لەمەدینەوە مەبەستی شەڕی ئەوانی كرد. عەبدالله كوڕی زوبەیر، عەباس كوڕی سەهل كوڕی سەعدی ساعدی وەك فەرمانداری مەدینە رەوانە كرد و فەرمانی پێدا بەدوای حوبەیشدا بڕوات تا بەسوپای خەڵكانی بەسرە بگات كە فەرماندەكەیان حونەیفە. عەباس بەدوای ئەواندا بەرێكەوت و لەرەبزە پێیان گەیشتەوە. حوبەیش بۆ شەڕی ئەوان ریزی بەست. یەزید كوڕی سەنان تیرێكی بۆ هاویشت و كوشتی. لەم رۆژەدا یوسف كوڕی حەكەم و كوڕەكەی حەجاج كوڕی یوسف لەگەڵیدابون. ئەم دوانە سوار لەسەر یەك وشتر بون. هاورێكانی هەڵاتن وپێنسەد كەس لەوان پەنایان بۆ مەدینە برد. عەباس كوڕی سەهل وتی: ملكەچی فەرمانەكانی من بن. ئەوان ملكەچ بون. ئەو هەموویانی كوشت. پاشماوەكانی سوپا هەڵاتوەكەی شام رویان لەسەرزەمینەكەی خۆیان كرد. كاتێك یەزید كوڕی سەنان ڕۆشتە ناو مەدینە، جل وبەرگی سپی لەبەر كرد، ئەوەندە خەڵك دەستیان لێدا و بۆنی خۆشیان بەسەردا پرژاند، جلەكانی ڕەش بو.

## مەرگی مەروان كوڕی حەكەم فەرمانڕەوایی كوڕەكەی عەبدولمەلیك

لەمانگی رەمەزانی ئەم ساڵە/ ئاوریلی ٦٨٥ زایینی مەروان كوڕی حەكەم مرد.

هۆكاری مردنەكەی ئەوەبو كە، كاتێك وادەی مردنی معاویە كوڕی یەزید گەیشت، كەسی وەك جێگری خۆی دەستنیشان نەكرد. حەسان كوڕی بەجدەل دەیویست كاری فەرمانڕەوایی دوای ئەو بەبراكەی خالید كوڕی یەزید بسپێرێت. ئەو منالێكی كەم تەمەن و حەسان خاڵی باوكی یەزید. حەسان لەگەڵ مەروان كوڕی حەكەم بەیعەتی بەست بەلآم دەیویست دوای ئەو فەرمانڕەوایی بكەوێتە دەست خالید كوڕی یەزید. كاتێك ئەو و خەڵكانی شام لەگەڵ مەروان بەیعەتیان كرد، ئەمیان لەگەڵ دایكی خالید پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەو كچی ئەبوهشام كوڕی عوتبە بو. مەروان ئەوی كردە هاوسەری خۆی. رۆژێك خالید ڕۆشتە لای مەروان و دەستەیەك لەخەڵكان لای ئەو

دانیشتبون. کوڕەکە لەنێوان دوریزەوە تێپەڕی. مەروان وتی: تۆ کوڕێکی نەزانیت! وەرە کوڕی نەزان وگێژ کە بەردەوام پشتی دایکی تەڕە! بەمشێوە قسەی لەگەڵ دەکرد تا لەبەر چاوی خەڵکانی شام سوك و کەم بەهای بکات.

خالید بۆ لای دایکی گەڕایەوە و لەم وتەیە ئاگاداری کردەوە. ژن وتی: جگە لەمن و تۆ کەس ئەمە نازانێت (با کەس نەزانێت) من لەو رزگارت دەکەم. مەروان ڕۆشتە لای ژنەکە و پرسی: ئایا خالید سەبارەت بەمن هیچی بەتۆ وت. ژن وەڵامی دایەوە: نە، ئەو زیاتر لەوە ڕێزت لێدەگرێت کە شتێك سەبارەت بەتۆ بێنێتە سەر زمان. خالید ئەو ژنەی بەراستگۆ زانی و چەندین ڕۆژ چاوەڕێی کرد. ڕۆژێك مەروان لەماڵی ئەو ژنە خەوت. ژن ئەوی بەپشتیەك داپۆشی و کوشتی (پشتیەکەی خستە سەردەمی و لەسەری دانیشت تا خنکا)ئەو لەدیمەشق مرد و لەم کاتەدا تەمەنی شەست و یەك ساڵ بو. عەبدولەلیك بڕیاریدا دایکی خالید بکوژێت بەڵام پێیان وت: ئەگەر ئەم کارە بکەیت، خەڵك دەزانن کە ژنێك باوکی تۆی کوشتوە. عەبدولەلیك دەستبەرداری بو.

کاتێك مەروان مرد، کوڕەکەی عەبدولەلیك کاروباری شامی گرتە دەست. کوڕەکەیتری یانی عەبدولعەزیز فەرمانڕەوایی میسری دەکرد و ملکەچی فەرمانەکانی براکەی بو.

عەبدولەلیك بەحەوت مانگ لەدایك ببو و خەڵك لەبەر ئەمە سەرکۆنەیان دەکرد. دەڵێن: دەستەیەك لەگەورەکان لای ئەو کۆبونەوە و ڕاوێژیان کرد. ئەو بەعوبەیداللە کوڕی زیاد کوڕی زەبیانی بەکری وت: منیان ئاگادار کردۆتەوە کە تۆ هاوشێوەی باوکت نیت. وتی: لەناو بەناو و قەلەڕەش بە قەلەڕەش هاوشێوەی ئەوم. بەڵام ئەگەر بتەوێت تۆ ئاگادار دەکەمەوە لەو کەسەی منداڵدان تا کاتی خۆی هەڵینەگرت و پێش کاتی خۆی فڕیاندایەدەر و خاڵەکان و مامەکان ئەویان بەهاوشێوەی خۆیان نەزانی. وتی: ئەم کەسە کێیە؟ وتی: سومید کوڕی مەنجوف. کاتێك عوبەیداللە و سومید هاتنەدەر، سومید بەعوبەیداللەی وت: بەرادەیەك لەوتارەکەی تۆ شادمان بون کە ئەگەر گایەلێك وشتری سورمویان بەمن دەدا، ئەوەندە شادمان نەدەبوم. عوبەیداللە وتی: بەرادەیەك لەخۆڕاگری تۆ بۆ وتەکانی خۆم شادمان بوم کە ئەگەر گایەلێك وشتری سورمویان پێدەبەخشیم، ئەوەندە شادمان نەدەبوم.

(ڕوی دەمم لەتۆ بو بەڵام تانەم لەخەلیفەی ڕوسپی زادە دەدا).

## نەژادی ئەو کارەکان و پاساکانی

ئەو مەروان کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی ئەلحەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص کوڕی ئومەییە کوڕی عەبد شەمس بو. دایکی ئامینە کچی عەلقەمە کوڕی صەفوان کوڕی ئومەییە لەکەنانە بو. مەروان لەساڵی دوەمی کۆچی /٦٢٣ زایینی لەدایك بو. باوکی لەرۆژی گرتنی مەککە باوەڕی هێنا. پێغەمبەر ئەوی بۆ تایف دورخستەوە چونکە لەزیانی ئەو قسە و دوزمانی دەکرد. رۆژێك پێغەمبەر ئەوی بینی کە لەپشت سەریەوە بەرێگادا دەڕوات و خۆی لار و خوار دەکات. وەك بڵێی دەیوست کارێك بکات خەڵك بەپێغەمبەر پێبکەنن. پێغەمبەر پێی وت: بەهەمان شێوە بە. ئەو تا کۆتای تەمەنی بەوشێوە خوا و گێر بەرێگادا دەڕۆشت.

کاتێك پێغەمبەر مرد، عوسمان سەبارەت بەو لەگەڵ ئەبوبەکر قسەی کرد تا فەرمان بدات ئەو بۆ مەدینە بگەڕێتەوە، بەڵام ئەبوبەکر رازی نەبو. چونکە مامی عوسمان بو. کاتێك عومەر هاتە سەر کار، عوسمان ئەو داوای لەعومەر کرد بەڵام عومەریش رازی نەبو. کاتێك عوسمان هاتە سەرکار، ئەوی گەڕاندەوە و پاساوی ئەم کارەی بۆ ئەوە گەڕاندەوە کە پێغەمبەر مژدەی گەڕانەوەی پێداوە. ئەمە یەکێك بو لەو کارانەی خەڵك بەهۆیەوە رەخنەیان لەعوسمان گرت و بەم شێوەیە سەرکۆنەیان دەکرد.

باوکی مەروان لەسەردەمی خەلافەتی عوسمان مرد و عوسمان نوێژی لەسەر خوێند. گێڕانەوەی زۆر سەبارەت بەنفرین کردنی ئەو و بنەماڵەکەی بەدەستمان گەیشتوە کە حافز ئاماژەی بەهەمویان داوە. لێکۆڵەرەوان سەبارەت بەم گێڕانەوانە بۆچون و رای جیاوازیان هەیە.

مەروان پیاوێکی کورتە باڵا و سورپێست و مل کورت بو. نازناوەکەی ئەبو حەکەم و باوکی عەبدولمەلیك بو. سامانێکی ئەوەندە لەبەردەستا بو کەدەیتوانی رۆژی سەد کۆیلە ئازاد بکات. چەندین جار لەلایەن معاویەوە کرایە فەرمانداری مەدینە. کاتێك دەهاتە سەرکار، لەجوێندان و سەرکۆنەکردنی عەلی زێدەڕۆیی دەکرد. کاتێك لەسەر کار لادەبرا و سەعید کوڕی عاص دەهاتەسەرکار، دەستی لەو کارانە هەڵدەگرت. لەمحەممەد کوڕی عەلی باقر (ئیمامی پێنجەمی شیعەکان) سەبارەت بەو پرسیاریان کرد. وتی: مەروان لەپشتەوە بۆ ئێمە باشتر بو و سەعید بەئاشکرا.

حەدیسەکانی مەروان لەکتێبی (صحیح) دا هاتوە. حەسەن و حسین لەپشت سەری ئەو نوێژیان دەخوێند و نوێژەکەی خۆیان دوبارە نەدەکردەوە. ئەو یەکەم کەس بو وتاردانی لەرۆژی جەژن پێش خست و لەنوێژی رۆژەکانیتر کاتەکەی هێنایە پێش.

کاتێك مەروان مرد، خەڵك لەهەمان رۆژ لەگەڵ کوڕەکەی عەبدولەلیك بەیعەتیان بەست. بەو و منالەکانیان دەوت (بەنی زەرقا )کوڕەکانی ژنی چاوەڕەش و ئەمە لەسەر زمانی ئەو کەسانەی دەیانویست سەرکۆنە و ئیهانەیان بکەن. زەرقا کچی مەوهیب باوەگەورێی (لەدایکەوە) مەروان بو. ژنێکی خراپ بو و ئالأیەکی لەسەر ماڵەکەی خۆیدا هەڵکردبو و هەر کەسێك دەیویست بڕواتە ماڵی ژنە لەشفرۆشەکان، لەوێوە نیشانەی وەردەگرت. لەبەر ئەمە سەرکۆنەی ئەو ژنەیان دەکرد. ئەگەری هەیە ئەمە پێش ئەوە بوبێت کە ئەبوئەلعاص کوڕی ئومەییە، باوکی مەروان ئەو ژنە بکاتە هاوسەری خۆی چونکە ئەو یەکێك لەگەرەکانی قوڕەیش بو و شیاو نەبو هاوسەرەکانی ئەو کارە بکەن. و خوا زاناترە.

## کوژرانی نافیع کوڕی ئەزرەق

لەم ساڵەدا شکۆ و گەورەیی نافیع کوڕی ئەزەرق بەرزبویەوە. ئەو کەسێکە کە ئەزرەقان یا ئەزاریقە لەخەواریج بۆ ئەو دەگێڕنەوە.

هۆکاری ناسازگاری نافیع، سەرقاڵی و گرفتاری و چەندبەرەکی و بڵاوی خەڵکانی بەسرە و رێکنەکەوتنیان لەسەر مەسعود کوڕی عەمرۆ و کوژرانی ئەو بو. دەستەکانی ئەو فراوان بون و بەرەو پرد بەرێکەوت. عەبداللە کوڕی حارس، موسلیم کوڕی عوبەیس کوڕی کورەیز کوڕی رەبیعەی بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد. موسلیم کوڕی عوبەیس ئەوی لەپانتاییەکانی بەسرە دورخستەوە و گەیاندیە دولاب لەسەرزەمینی ئەهواز. لەوێ شەڕیان کرد. موسلیم کوڕی عوبەیس، حەجاج کوڕی بابی حەمیری کردە فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی و حارس کوڕی بەدری غەدانی کردە فەرماندەی باڵی چەپ. کوڕی ئەزرەق عوبەیدە کوڕی هیلالی کردە فەرماندەی باڵی راست و زوبەیر کوڕی ماحوزی تەمیمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ. شەڕەکەیان روی لەدژواری کرد. موسلیم فەرماندەی خەڵکانی بەسرە کوژرا و نافیع کوڕی ئەزرەق سەرەپەرەستی خەواریج لەجەمادی الثانی / ژانویەی ٦٨٥ زایینی. خەڵکانی بەسرە حەجاج کوڕی بابی حەمیریان

وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد و خەواریج عەبدالله كوڕی ماحوزی تەمیمی. شەڕیان دەست پێكرد. حەجاج و عەبدالله كوژران. خەڵكانی بەسرە رەبیعە كوڕی ئەجرەمی تەمیمیان كردە فەرماندەی خۆیان و خەواریج عوبەیدالله كوڕی ماحوزی تەمیمی. دواتر رویان لەگۆڕەپان كرد و شەڕیان كرد تا شەو داهات. ئەوان لەیەك بێزاربون و شەڕیان بەناخۆش زانی.

هەردولا ئارام بون و دەستیان لەشەڕ كێشابویەوە تا كەمێك بحەسێنەوە. شەرِكەری تازە پەیوەستی خەواریج بون و لەلایەن عەبدقەیسەوە هێرشیان كردە سەر خەڵك. خەڵكان شكستیان خوارد و فەرماندەی خەڵكانی بەسرە رەبیعە كوڕی ئەجرەم كوژرا كە پێش ئەو دەغفەل كوڕی حەنزەلەی شەیبانی كوژرابو. حارس كوڕی بەدر ئاڵاكەی هەڵگرت و ماوەیەك شەڕی ئەزمون كرد بەڵام خەڵك لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێكردبو و تەنیا دەستەیەك لەخەڵكانی بەسرە هاوڕێیەتیان دەكرد. دواتر بەرێكەوت و لەئەهواز دابەزی. هەواڵی ئەم شەرە بەخەڵكانی بەسرە گەیشت و پەرێشانی كردن. عەبدالله كوڕی زوبەیر، حارس كوڕی ئەبی رەبیعەی رەوانە كرد و عوبەیدالله كوڕی حارسی لەسەر كار لابرد. خەواریج رویان لەبەسرە كرد.

## شەڕی موهەلیب لەگەڵ خەواریج

كاتێك خەواریج لەبەسرە نزیك كەوتنەوە، خەڵك ڕۆشتنە لای ئەحنەف كوڕی قەیس و داوایان لێكرد فەرماندەیی كاروباری شەڕ بگرێتە ئەستۆ. ئەو پێشنیاری بەوان كرد كە موهەلیب كوڕی ئەبی صوفرە بكەنە فەرماندەی خۆیان چونكە دەیزانی پیاوێكی بوێر، زانا و شارەزا لەكاروباری جەنگە. موهەلیب لای كوڕی زوبەیر دەگەڕایەوە كەئەوی وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەستنیشان كردبو. ئەحنەف وتی: ئەم كارە تەنیا لەموهەلیب دەوەشێتەوە.

گەورەكانی بەسرە ڕۆشتنە لای و قسەیان لەگەڵ كرد. ئەو رازی نەبو. حارس كوڕی ئەبی رەبیعە قسەی لەگەڵ كرد و موهەلیب داوای لێبوردنی لەوان كرد لەبەر ئەوەی فەرمانداری خوراسانیان بەو سپاردوە. حارس و خەڵكانی بەسرە لەزمانی كوڕی زوبەیرەوە نامەیەكیان دروست كرد و بۆیان هێنا كە تیایدا فەرمانی شەڕ لەگەڵ خەواریجی پێدەدا. كاتێك خوێندیەوە، وتی: سوێند بەخوا شەڕی ئەوان ناكەم مەگەر

ئەوەی دەمەوێت بیخەنە بەردەستم ولەگەنجینە ئەوەندە زێر وزێوم پێببەخشن تا بتوانم هاورێکانمی پێ بەهێز و بەتوانا بکەم.

ئەوان رازی بون و لەمبارەوە نامەیەکیان بۆ نوسی. نامەکەیان بۆ کوڕی زوبەیر رەوانە کرد و پشت راستی کردەوە. موهەلیب لەناو خەڵکانی بەسرە پیاوە ئازا و بەهێزەکانی هەڵبژارد. دوانزە هەزار پیاوی شەڕکەر بون: ئەم کەسانە لەناویاندا بون: محەممەد کوڕی واسع، عەبداللە کوڕی ریاحی ئەنساری، معاویە کوڕی قورەی موزنی و ئەبو عیمرانی جەویی. موهەلیب بەرەو لای خەواریج بەرێکەوت کە لەشوێنی پردی بچوك بون. هاورێ لەگەڵ گەورەکانی خەڵك شەڕی ئەوانی کرد و ئەوانی لەدەوری پردەکە دورخستەوە. ئەوەندە نەمابو برۆنە ئەوێ. ئەوان بەرەو پردی گەورە ڕۆیشتن. موهەلیب بەسوارە و پیادەکانی خۆی هێرشی کردە سەریان. کاتێك خەواریج بینیان لێیان نزیك بۆتەوە، ئەوێشیان بەجێهێشت.

کاتێك بەحارسە کوڕی بەدریان وت کە موهەلیبان کردۆتە سەرکردەی شەڕ لەگەڵ ئەزرەقیەکان، بەخەڵکی دەوروبەری خۆی وت:

کرنبوا و دولبوا حیث شئتم فانهبوا

یانی: بسوڕێن و پێچ بکەنەوە، بۆ هەر شوێنێك دەتانەوێت برۆن.

ئەو لەگەڵ هاورێکانی خۆی روی لەبەسرە کرد و حارس کوڕی ئەبی رەبیعەی بۆ لای موهەلیب گەڕاندەوە. حارسە کوڕی بەدر سوار کەشتی بو و لەروباری دوجەیل بۆ پێشەوە ڕۆشت و مەبەستی بەسرەی کرد. خەڵکێك لەهۆزی تەمیم لێی نزیك کەوتەوە. پیاوەکە بەکەل وپەلی شەڕ تەیار و خەواریج لەپشت سەریەوە بون. تەمیمی هاواری کرد و داوای هاوکاری لەحارس کرد تا لەگەڵ خۆی بیبات. ئەو کەشتیەکەی لەکەنارەکان نزیك کردەوە. تەمیمی پەڕیە ناو کەشتیەکە و کەشتی بەهەمو ئەفەرەکانیەوە کەوتەژێر ئاو و خنکان.

بەڵام موهەلیب، ئەو بەرێکەوت تاگەیشتە خەواریج و ئەوان لەکەنارەکانی روباری تیری بون. لەو دورکەوتنەوە و رێگەی ئەهوازیان گرتەبەر. موهەلیب هەواڵنێرانی بۆ لەشکرگەکەی ئەوان رەوانە کرد تا لەبارودۆخ ئاگاداری بکەنەوە. کاتێك لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار بویەوە، بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و براکەی مەعارك کوڕی ئەبی

صوفرەی لەروباری تیری بەجێهێشت. کاتێك گەیشتە ئەهواز، خەواریج شەڕیان لەگەڵ پێشەنگەکانی سوپاکەی ئەو کرد. فەرماندەی پێشەنگەکان موغەیرە کوڕی موهەلیب کوڕی ئەبی صوفرە بو. هاوەڵانی چەند هێرشێکیان کرد و گەڕانەوە.

کاتێك خەواریج بینیان ئەوان بەردەوام شوێنیان دەکەون، لە (سوق الاهواز) رۆشتنە (منازر). ئەو شوێن ئەوان کەوت. کاتێك لێیان نزیك کەوتەوە، خەواریج دەستەیەکیان بەسەرکردایەتی واقد کۆیلەی ئەبوصوفرە بۆ روباری تیری رەوانە کرد کە معارك کوڕی ئەبی صوفرە لەوێ بو. موهەلیب کوڕەکەی موغەیرە کوڕی موهەلیبی بۆ روباری تیری رەوانە کرد. ئەو مامەکەی دۆزیەوە و بەخاکی سپارد و خەڵکی ئارام کردەوە و دەستەیەکی وەك جێگری خۆی لەوێ دانان و بۆ لای باوکی گەڕایەوە کە لە سولاف بەسەری دەبرد.

موهەلیب دورئەندێش و وشیار بو. هەرجار کەدەڕۆشت، دەڕۆشتە ناو سەنگەرەکان و خۆی کاری پاسەوانی کردنی دەگرتە ئەستۆ. کاتێك لەسولاف روبەروی خەواریج بویەوە، سوار بون و لەبەرابەر ئەو خۆڕاگریان کرد و بەسەختی شەڕیان کرد. هەردولا خۆڕاگریان لەخۆیان نیشاندا. دواتر خەواریج بەشێوەیەکی قورس هێرشیان کردە سەر موهەلیب و هاورێکانی کە شکەستیان خوارد و کوشتار کران. موهەلیب سەرسەختانە خۆڕاگری کرد وکوڕەکەی لەو رۆژە ئەزمونێکی باشی لەخۆی نیشاندا کە دواهاتەکانی دەرکەوت. موهەلیب بانگی هاورێکانی خۆی کرد کە لەناو دەستەیەکی فراوانی چوار هەزار کەسی بۆ لای ئەو گەڕانەوە. کاتێك بەیانی بویەوە، مەبەستی شەڕ لەگەڵ ئەوانی کرد بەڵام دەستەیەك لەهاوەڵانی رێگەی ئەم کارەیان لێگرت چونکە ناتەوان و بریندارەکانیان فراوان بون. ئەو شەڕی پشت گوێ خست و بەرێکەوت و دوجەیلی بڕی و لەعاقول دابەزی بەشێوەیەك تەنیا لەیەك رێگەوە دەیانتوانی دەستیان بەو بگات. کوڕی قەیسی روقیات سەبارەت بەشەڕی سولاف دەڵێت:

| | |
|---|---|
| الا طرقت من ال مية طارق | علة انها معشوقة الدل عاشقه |
| تميس و ارض السوس بينى و بينها | و سولاف رستاق حمته الاوارقه |
| اذا نحن شتى صادفتنا عصابة | حرورة اضحت من الدين مارقه |
| اجازت الينا العسكرين كليهما | فباتت لنادون اللحاف معانقه |

یانی: بزانن لەبنەماڵەی (مەیبە) کەسێك شەوانە هات و لەدەرگای دا، وای نیشاندا کە هەمان دڵدایە کە شەیدای بوە. ناز دەکات و لەنێوان من وئەو سەرزەمینی شووشە و سولاف کە گوندێ پارێزراوی ئەزاریقەیە. لەو کاتەی بلاوەمان لێکردبوە، دەستەیەك لەخەڵکان هێرشیان کردە سەرمان، ئەو حرووریانە بون کە لەدین هەڵگەڕابونەوە. ئەم دەستەیە لای هەر دو سوپاکە تێپەڕین و خۆیان بەئێمە گەیاند، پێش ئەوەی بڕۆینە ناو جێگە، خۆشەویستیان نیشاندا و ئێمەیان لەئامێز گرت.

هەروەها یەکێك لەخەواریج لەمبارەوە وتی:

و کائن ترکنا یوم سولاف منهم اساری و قتلی فی الجحیم مصیرها

یانی: چەندە کەسانی گەردنکێش و یاخی بون ئەوانمان لەشەڕی سولاف خستە سەرخاك، یا گرفتارمان کردن، ئەسیرمان کردن و لەخاك و خوێندا ئەوانمان گەوزاند و رەوانەی دۆزەخمان کردن.

شاعیران سەبارەت بەم شەڕە هۆنراوەی زۆریان هۆنیوەتەوە.

کاتێك موهەلیب گەیشت عاقول، لەوێ دابەزی وبۆ ماوەی سێ رۆژ مایەوە و دواتر رویکردە خەواریج کە لەسیلی و سیلبەری بون. لەنزیکی ئەوان دابەزی. ئەو کاری زۆری دەکرد کە خەڵك گفتوگۆیان لەبارەوە دەکرد و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکرد بەڵام هیچ نیشانەیەکیان نەدەبینی. تەنانەت یەکێك لەشاعیرەکان وتی:

انت الفتی کل الفتی لو کنت تصدق ما تقول

یانی: تۆ جوامێریت، جوامێریکی زۆر گەورەیت، خۆزگە ئەوەی دەیڵێیت بەکاری ببەیت. دەستەیەك ئەویان بە درۆزنەکە ناو دەبرد و دەستەیەك گومانیان دەکرد ئەو بەردەوام و لەهەر کاتێکدا درۆ دەکات. بەم شێوە نەبو کە گومانیان دەکرد بەڵکو ئەو فێڵی لەدوژمنەکانی دەکرد.

کاتێك موهەلیب لەنزیك خەواریج دابەزی، سەنگەرەکانی هەڵکەند و پێگەکانی دروست کرد و هەواڵنێران و پاسەوانانی دانا. خەڵك بە ئامادەیی تەواو بۆ شەڕ کردن لەژێر ئالاکانی خۆیاندا بون و درگای سەنگرەکان پارێزگاریان لێدەکرا. هەرجار کەدەیانویست شەوانە و لەناکاو هێرش بکەنە سەری، خۆیان روبەروی کارێکی دژوار دەبینەوە و دەگەڕانەوە. کەس بەسەرسەختی موهەلیب دژی خەواریج شەڕی نەدەکرد.

دواتر خەواریج شەوانە سوپایەکیان بەسەرکردایەتی عوبەیدە کوڕی هیلال و زوبەیر کوڕی ماحوز رەوانە کرد تا لەناکاو هێرش بکەنە سەر موهەلیب. لەچەپ و راستەوە هێرشیان برد و هاواریان کرد بەڵام ئەوانیان بەئامادەیی تەواو بۆ شەڕ کردن بینی کە وشیارن و ترسیان نیە. لەبەر ئەمە، نەیانتوانی هیچ کارێك بکەن. موهەلیب شەوی کردە بەیانی و بەئامادەیی تەواو هێرشی کردە سەریان. ئەزدیەکان و تەمیمیەکانی لەباڵی راست دانا، بەکر کوڕی وایل و عەبدقەیسی لەباڵی چەپ و خەڵکی عالیەی لەناوەڕاستی سوپاکەی جێگیر کرد. خەواریج هاتنەدەر و فەرماندەی باڵی راستیان عوبەیدە کوڕی هیلالی یەشکری و فەرماندەی باڵی چەپ زوبەیر کوڕی ماحوز. ئەوان زۆرترین ساز و بەرگ و کەرەستەی شەڕیان لەبەردەستا بو لەگەڵ باشترین ئەسپەکان. سوپاییەکان و سامانەکەی خۆیان لەبەسرە هەڵگرتبو چونکە ئەوان هەمو سەرزەمینەکان لەنێوان کرمان تا ئەهوازیان بڕیبو و لەهەمو شتێك دەستیان شۆردبو. خەڵك بەقورسترین شێوە شەڕیان کرد. هەردولای شەڕکەر سەراسەری رۆژ خۆڕاگریان کرد. دواتر خەواریج هێرشیان کردە سەر خەڵکان و ئەوانیان تێکشکاند بەشێوەیەك هەمویان رێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر و کەس ئاوڕی بۆ دواوە نەدایەوە. شکەستی ئەوان تا دەروازەکانی بەسرەی گرتەوە بەشێوەیەك خەڵك لەدیل کران دەترسان.

موهەلیب بەپەلە راکردنی دەست پێکرد وپێش هەڵاتوان کەوتەوە و ڕۆشتە شوێنێکی بەرز و هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا! لای من کۆببنەوە. سێ هەزار پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆبونەوە کە زۆربەیان لەخەڵکانی ئەزد بون. کاتێك ئەوانی بینی، ژمارەکەیانی بەپەسەند زانی، قسەی بۆکردن وبۆ شەڕ هانیدان و مژدەی سەرکەوتنی پێدان و فەرمانی کرد کەهەر پیاوێك دەبەردی گەورە هەڵبگرێت. وتی: لەگەڵ ئێمە هێرش بکەنە سەر لەشکرگەکەی ئەوان کە ئێستا ئاسودەن و سوارەکانیان شوێن براکانتان کەوتون. سوێند بەخوا هیوادارم سوارەکانیان بۆ لای ئەوان نەگەڕێنەوە مەگەر ئەو کاتەی ئێوە ئەوانتان کوشتار کردبێت. هاورێ لەگەڵ ئەوان گەڕایەوە. خەواریج نەکەوتبونە خۆ کە بینیان موهەلیب لەکەنارەکانی سوپاکەیان جێگیرە و هێرش دەکات سەر ئەوان. عەبدالله کوڕی ماحوز و خەواریج روبەرویان بونەوە. هاورێکانی موهەلیب ئەوانیان بەردباران کرد و شەکەتیان کردن. دواتر بەرم و شمشێر کەوتنە گیانیان.

ماوەیەك شەڕیان کرد و عەبدالله کوڕی ماحوز کوژرا و ژمارەیەکی زۆریان کەوتنە سەرزەوی. موهەلیب و سوپاکەی لەشکرگەکەی ئەوانیان تالآن کرد. ئەوانەی شوێن خەڵکانی بەسرە کەوتبون، گەڕانەوە. موهەلیب سوار وپیادەکانی بۆ کوشتاری ئەوان جێگیر کردبو کەئەوانیان دەڕفاند و دەیانکوشتن. دواتر تێکشکاو گەڕانەوە. دوای ئەوە بەرەو کرمان و سنورەکانی ئیسفەهان رەوانە بون.

کاتێك یەکێك لەخەواریج بینی، هاوەڵانی موهەلیب ئەوان بەردباران و کوشتار دەکەن، وتی:

بسلی و سلبری مصارع فتیة                    کرام و قتلی لم توسد خدودها

یانی: لەسەلی و سەلبری کوشتارگای گەنجە رێزدارەکانە و کوژراوەکان لەسەر زەوی کەوتون کەروخساریان لەسەر سەرینەکان دانەنراوە.

کاتێك عەبدالله کوڕی ماحوز کوژرا، خەواریج زوبەیر کوڕی ماحوزیان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد.

موهەلیب بۆ حارس کوڕی رەبیعە نامەی نوسی و ئەوی لەسەرکەوتنەکەی خۆی ئاگادار کردەوە. حارس نامەیەکی بۆ کوڕی زوبەیر لەمەککە نوسی تا بۆ خەڵك بخوێندرێتەوە.

حارس بۆ موهەلیبی نوسی: دوای سڵاو، نامەکەی تۆ گەیشت کە هەواڵی هاوکاری خواوەند و سەرکەوتنی موسوڵمانان بو. پیرۆزت بێت ئەی برای ئەزدی کەسەروەری ئەم دنیا و پاداشتی ئەو دنیات بەدەست هێنا. کاتێك موهەلیب نامەکەی خوێندەوە، پێکەنی و وتی: من تەنیا بەنیشانی برای ئەزدی دەناسێت! پیاوێکی بیابان نشینی سەرسەریە.

دەڵێن: عوسمان کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر پێش موسلیم کوڕی عوبەیس کوڕی کورەیز کوڕی رەبیعە شەڕی لەگەڵ خەواریج و نافیع کوڕی ئەزرەق کرد. عوسمان کوژرا و هاورێکانی شکستیان خوارد و پێش ئەوە، دەستەیەکی فراوان لەخەواریج کوشتار کران. دوای ئەوە، لەبەسرە حارسە کوڕی بەدری غەدانی بەرەو لای ئەوان رەوانە بو. کاتێك ئەوانی بینی، زانی کەناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. لەبەر ئەمە بەهاوەڵانی خۆی وت:

کرینبوا و دولبوا                    کیف شئتم فاذهبوا

یانی: بسوڕێن و پێچ بکەنەوە، بۆ هەر شوێنێك دەتانەوێت بڕۆن.

دوای ئەو موسلیم کوڕی عوبەیس رەوانە بو.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك موهەلیب خەواریجی لەبەسرەوە بۆ پانتاییەکانی ئەهواز دورخستەوە، پاشماوەی ئەو ساڵەی لەو دیارە بەسەر برد و لەشارەکانی دیجلە باجی وەردەگرت و رۆژی هاورێکانی خۆی دەدا. هێزە پشتیوانەکان لەبەسرەوە پەیوەستی بون و هاورێکانی بۆ نزیکەی سێ هەزار شەڕکەر زیادیان کرد.

لەسەر ئەم بنەمایە، شکستی خەواریج لەساڵی ٦٦/٦٨٥- ٦٨٦ زایینی رویدا.

## بەسەرهاتی نەجدە کوڕی عامری حەنەفی

ئەو نەجدە کوڕی عامر کوڕی عەبداللە کوڕی ساد کوڕی موفرەجی حەنەفیە. ئەو لەگەڵ نافیع کوڕی ئەزرەق بو بەڵام بەهۆی ناسازگاری لەکاروبارە دینیەکان لێی جیابویەوە بەهەمانشێوە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا، بەرەو یەمامە بەرێکەوت و داوای لەئەبو تالوت کرد شوێن باوەڕەکانی ئەم بکەوێت. دواتر رۆشتە حەزارم (تایبەت بەبەنی حەنیفە) و تاڵانی کرد. معاویە کوڕی ئەبی سوفیان حەزارمی لەبەنی حەنیفە وەرگرتبو و کۆیلەکانی لەوێ نیشتەجێ کرد. ژمارەی ئەوان و ژمارەی کوڕەکان و ژنەکانیان دەگەیشتە چوار هەزار کەس. نەجدە سامانە تاڵانکراوەکانی حەزارمی لەناو هاوەڵانی خۆی دابەش کرد. ئەم روداوە لەساڵی ٦٥/ ٦٨٤-٦٨٥ زایینی رویدا. هاورێکانی ئەو زیادیان کرد.

دواتر کاروانێك لەبەحرەین یا بەسرەوە بەرێکەوت کە سامان و کاڵاکانی بۆ کوڕی زوبەیر دەبرد. نەجدە کوڕی عامر دەستی بەسەرداگرت و لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای ئەبو تالوت لەحەزارم کە لەناو شوێنکەوتەکانی خۆی دابەشی کرد. وتی: ئەم سامانە لەناو خۆتانا دابەش بکە و ئەم کۆیلانە بگەرێیننەوە و رێگە بدەن لەسەرزەمینەکانی ئێوە کشتوکاڵ بکەن چونکە ئەمە سودی بۆ ئێوە زیاترە. ئەوان سامانەکەیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد و وتیان: نەجدە بۆ ئێمە باشترە لەئەبو تالوت. ئەبو تالوتیان لەسەر کار لابرد و لەگەڵ نەجدە بەیعەتیان بەست و تالوتیش بەیعەتی بەست. ئەمە لەساڵی ٦٦/ ٦٨٥-٦٨٦ زایینی رویدا.

دواتر لەگەڵ دەستەیەك هێرشی کردە سەر بەنی کەعب کوڕی رەبیعە کوڕی عامر کوڕی صەعصەعە و لە (زوالمجاز) روبەرویان بویەوە و ئەوانی تێك شکاند و کوشتاری کردن.

کەلاب کوڕی قورە کوڕی هوبەیرەی قوشیری و عوتیف کوڕی قورە کوڕی هوبەیرەی قوشیری خۆڕاگریان کرد و شەڕیان کرد تا کوژران. قەیس کوڕی روقادی جوعدی شکستی خوارد و براکەی لەباوکەوە معاویە کوڕی روقاد خۆی پێگەیاند و داوای لێکرد لەپشت سەری خۆیەوە سواری بکات بەڵام نەیکرد.

نەجدە کوڕی عامر بۆ یەمامە گەڕایەوە و شوێنکەوتەکانی فراوان بون و ژمارەیان گەیشتە سێ هەزار کەس. ئەو لەساڵی ٦٧/ ٦٨٦ – ٦٨٧ ڕۆشتە بەحرەین. ئەزدیەکان وتیان: نەجدە بۆ ئێمە لەفەرماندارەکەمان باشترە چونکە ستەم بەناڕەوا دەزانێت بەڵام فەرماندارەکانی ئێمە بەڕەوای دەزانن. بڕیاریاندا ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەو بگرنەبەر. خەڵکی عەبدقەیس و دانیشتوانی بەحرەین (جگە لەئەزدیەکان) بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو یەکیانگرت. یەکێك لەئەزدیەکان وتی: نەجدە بەئێوە لەئێمە نزیکترە چونکە هەموتان خەڵکی ڕەبیعەن. کەواتە شەڕی لەگەڵ مەکەن! کەسانیتر وتیان: ڕێگە نادەین نەجدەی حروری لەدین هەڵگەڕاو، فەرمانەکانی خۆی بەسەر ئێمەدا بسەپێنێت. لەقەتیف ڕوبەڕوی یەك بونەوە و خەڵکی عەبدقەیس شکەستیان خوارد و دەستەیەکی فراوان لەوان کوشتار کران. نەجدە هەر کەسێکی لەقەتیفیەکان دەبینی، ئەسیری دەکرد. وتاردەر وتی:

نصحت لعبد القيس يوم قطعها　　　　و ما نفع نصح قيل لا يتقبل

یانی: لەرۆژی شەڕی خەڵکی عەبدقەیس، ئامۆژگاریم کردن بەڵام لەکۆنەوە وتویانە: چ سود لەو ئامۆژگاریەی کە بەگوێ ڕایەڵی وەرنەگیرێت و نەبیسترێت؟

نەجدە لەقەتیف مایەوە و کوڕەکەی مەترەح کوڕی نەجدەی بۆ سەر تێکشکاوەکانی خەڵکی عەبدقەیس ڕەوانە کرد کە لە (ثویر) شەڕیان لەگەڵ کرد. مەترەح و دەستەیەك لەهاوڕێکانی کوژران.

نەجدە دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بۆ سەرزەمینی خەت ڕەوانە کرد. ئەوان بەسەر خەڵکەکەیدا سەرکەوتن و ئەو لەبەحرەین مایەوە. کاتێك لەساڵی ٦٨/ ٦٨٨- ٦٨٩ مەصعەب کوڕی زوبەیر هاتە بەسرە، عەبداللە کوڕی عومەیری لەیسی ئەعوەری لەگەڵ چوار هەزار پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد. ئەو بەردەوام دەیوت: ئەی نەجدە، خۆڕاگر لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە چونکە ئێمە ڕاناکەین. ئەو هات و نەجدە لەقەتیف بو.

نەجدە هێرشی کردە سەر کوڕی عومەیر وئەو ئاناگا بو. بۆ ماوەیەکی درێژ شەڕی لەگەڵ کردن و ئەوان بڵاوەیان لێکرد. کوڕی عومەیر شەوی گەیاندە بەیانی و لەزۆری کوژراو بریندارەکانی خۆی ترسی لێ نیشت. نەجدە هێرشی کردە سەر ئەوان و زۆری نەخایاند شکستیان خوارد. نەجدە لەخوێن و سامانی ئەوان خۆش نەبو و ئەوەی لەناو لەشکرگەکەدا بو، تالآنی کرد. لەناو دیلەکان (دایکی منالّ) یەکێك لەهاوسەرەکانی کوڕی عومەیر بو. ئەو پێشنیاری کرد بۆ لای گەورەکەی رەوانەی بکات. ژن وتی: پێویستم بەکەسێکی وا نیە کە منی بەجێهێشت و ڕۆشت.

نەجدە دوای شکەستدانی کوڕی عومەیر، سوپایەکی بۆ عەممان رەوانە کرد و عەتیە کوڕی ئەسوەدی حەنەفی کردە سەرکردەی سوپاکەی. عەباد کوڕی عەبداللە کەپیرەپیاوێکی بەتەمەن بو، دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرتبو و کوڕەکانی سەعید کوڕی عەباد و سلێمان کوڕی عەباد باجیان لەکەشتیەکان وەردەگرت هەروەها لەشارەکان. کاتێك عەتیە کوڕی ئەسوەد لێیان نزیك کەوتەوە، روبەروی بونەوە و عەباد کوژرا و عەتیە بەسەر ئەو سەرزەمینەدا زالّ بو. مانگێك لەوێ مایەوە و دواتر بەجێیهێشت و کەسێکی بەناوی باوکی قاسم کردە جێگری خۆی. سەعید و سلێمان (هەردو کوڕەکەی عەباد) و خەڵکی عەمان باوکی قاسمیان کوشت.

دواتر ناسازگاری لەنێوان عەتیە و نەجدە دروست بو کە لەروداوی ساڵەکانی دواتر بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین. ئەو بۆ عەممان گەڕایەوە بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. لەبەر ئەمە لەرێگەی دەریاوە بەرەو کرمان ڕۆیشت و درەمی بەناوی (عەتەوی) لێدا و لەکرمان مایەوە. موهەلیب سوپایەکی بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد. عەتیە بۆ سیستان و لەوێوە بۆ سند هەڵات. سوارەکانی موهەلیب ئەویان لەقەندابیل گرت و کوشتیان. دەستەیەك دەڵێن: خەواریج ئەویان کوشت.

بەدوای شکستهێنانی عەبداللە کوڕی عومەیر، نەجدە کوڕی عامر کەسی بەرەو دەشت و بیابان رەوانە کرد تا زەکات لەخەڵکانی نیشتەجێی ئەو ناوچانە وەربگرێت. یارانی ئەو لە کازمە شەڕیان لەگەڵ بەنی تەمیم کرد. خەڵکانی تومیلع هاوکاری بەنی تەمیمیان کرد و ئەوان پیاوێك لەخەواریجیان کوشت. نەجدە کوڕی عامر شەڕکەرانی بۆ سەر خەڵکی تومیلع رەوانە کرد کە سی و چەند کەسیان لەوان کوشت و کەسانێکیان

بەئەسیری گرت. دواتر پێشنیاری شوێنکەوتنی خۆی پێدان کە رازی بون و زەکاتی لەوان وەرگرت. دواتر هاورێ لەگەڵ سوپایەك لەنەجدەوە بەرەو صەنعا غاریدا. خەڵکەکەی گومانیان دەکرد سوپایەکی گەورە لەپشت سەریەتی. لەبەر ئەمە بەیعەتیان لەگەڵ کرد. بەڵام کاتێك بینیان هێزی پشتیوانی ئەو لەئارادا نیە، لەبەیعەتەکەیان پەشیمان بونەوە. ئەم هەواڵەی بیست و بەوانی وت: ئەگەر بتانەوێت بەیعەتەکەم هەڵدەوشێنمەوە و ئازادتان دەکەم و هێرش دەکەمە سەرتان. وتیان: بەیعەتەکەی خۆمان ناشکێنین. ئەو کەسەکانی بۆ شارەکانی ئەو سەرزەمینە رەوانە کرد و زەکاتیان کۆکردەوە. نەجدە، ئەبو فەدیکی بۆ حەزرەمەوت رەوانە کرد و زەکاتەکانی ئەو سەرزەمینەی کۆکردەوە.

نەجدە لەساڵی ٦٨ یا ٦٩ / ٦٨٧- ٦٨٨ یا ٦٨٨ – ٦٨٩ لەگەڵ هەشتسەد پیاو حەجی کرد. دەستەیەك دەڵێن: دو هەزار و شەشسەد پیاو لەگەڵ ئەو حەجیان کرد. لەگەڵ کوڕی زوبەیر لەسەر ئەو بنەمایە رێککەوتن کە هەرکام لەگەڵ هاوەڵانی خوێ نوێژ بخوێنێت و کاریان بەیەك نەبێت.

کاتێك نەجدە لەحەج گەڕایەوە، بەرەو مەدینە بەرێکەوت. خەڵکەکەی بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد. عەبدالله کوڕی عومەریش شمشێری بەست. کاتێك نەجدە لەناو دارخورماکان بو، ئاگاداریان کردەوە کە کوڕی عومەر خۆی بۆ شەڕ ئامادە کردوە. ئەو بۆ تاییف گەڕایەوە و کچێکی لەکچەکانی عەمرۆ کوڕی عوسمان کە لای دایەنەکەی خۆی بو، وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. یەکێك لەهاورێکانی وتی: نەجدە بۆ ئەم کچە دەمارگیرە، تاقی بکەنەوە. کەسێك وتی: ئەو کچە بەمن بفرۆشە. نەجدە وتی: بەشی خۆم لەو ئازاد کرد، ئەو ئازادە. وتی: بیکە بەهاوسەری من. وتی: ئەم ژنە پێگەیشتوە و خۆی باشتر دەزانێت چی بکات چونکە دەسەڵاتی لەدەستی خۆیدایە. من ئازادی دەکەم. ئەو لەشوێنەکەی خۆی هەستا و رۆشتەدەر و گەڕایەوە و وتی: من ئازادم کرد بەڵام پەسندی نەکرد هاوسەر هەڵبژێرێت.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدولەلیك یا عەبدالله کوڕی زوبەیر نامەی بۆ نوسی: سوێند بەخوا ئەگەر کارێکی ناشایست لەوێ ئەنجام بدەیت، سەرزەمینەکانی تۆ بەسمی ئەسپەکانی خۆم دەشێلم بەشێوەیەك یەك بەکری زیندو نەمێنێتەوە.

نەجدە بۆ عەبدالله کوڕی عومەری نوسی و چەندین پرسیاری لێکرد. وتی: لەعەبدالله

کوڕی عەباس بپرسن. ئاماژەمان بەپرسیارەکانی ئەو لەکوڕی عەباس داوە.

کاتێك نەجدە لەتاییفەوە بەرێکەوت، عاصم کوڕی عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی هاتە لای و بەنوێنەرایەتی خەڵکەکەی بەیعەتی لەگەڵ کرد. نەجدە نەڕۆشتە ناو تاییف. کاتێك حەجاج کوڕی یوسف بۆ شەڕ لەگەڵ کوڕی زوبەیر ڕۆشتە تاییف، بەعاصمی وت: ئەی دوروو! بەیعەتت لەگەڵ نەجدە کرد؟ وتی: بەڵێ، دە روو و دە رەنگم، نەجدەم رازی کرد و زیانی ئەوم لەشارەکەم و خەڵکەکەم دور کردەوە.

ئەو حاروقی وەك فەرمانڕەوای تاییف و تەبالە و سورات دەستنیشان کرد و سەعد تەلایعی بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری نەجران. نەجدە بەرەو بەرحرەین رۆیشت و خۆراکی لەخەڵکی (دو بارەگا) و یەمامە گرتەوە. عەبداللە کوڕی عەباس نامەی بۆ نوسی: سەمامە کوڕی ئەسال لەکاتی باوەڕهێنان خۆراکی لەخەڵکانی مەککە گرتەوە و ئەوان بتپەرەست بون. پێغەمبەر بۆی نوسی: خەڵکانی مەککە کەسەکانی خوان، رۆژی لەوان مەگرە. ئەو رۆژەکانی رەوانە کرد. ئێمە موسوڵمانین و تۆ رێگەی خۆراکمان لێ درێغ دەکەیت. نەجدە خۆراکی ئەوانی رەوانە کرد.

کارگوزارانی نەجدە بەهەمان شێوە فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینەکانیان دەکرد تا رێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەویان گرتەبەر و خەڵك چاوی تەماحیان تێبڕی. لەتاییف شوێن حاروق کەوتن کە هەڵات. کاتێك لەعەقەبە لەرێگەی گەڕانەوەدا بو، ئەو کەسانەی بەدوایدا دەگەڕان، بینیان و بەردبارانیان کرد و کوشتیان.

## ناسازگاری لەسەر نەجدە کوڕی عامروکوژرانی ئەو، فەرمانداری کوڕی فەدیك

دواتر هاوەڵانی چەند کارێکیان لێ بینی کەپەسەندیان نەکرد و رێگەی ناسازگاریان گرتەبەر. یەکێك لەکارەکان ئەوە بو: ئەبو سەنان حەی کوڕی وایل پێشنیاری پێکرد کەئەو کەسانەی لەروی (خۆپارێزی) (تەقیە) شوێنی کەوتون و پەیوەستی بون، کوشتار بکات. نەجدە جوێنی پێدا. ویستی بیکوژێت. نەجدە وتی: ئایا خوا فەرمانی داوە کە لەنهێنی کارە داپۆشراوەکان بکۆڵینەوە؟ وتی: نە. وتی: کەواتە لەسەر ئێمە پێویستە تەنیا بەروکەکشی کارەکان بەسەندە بکەین.

لەناو ئەوان: عەتیە کوڕی ئەسوەد سەرپێچی فەرمانەکانی نەجدەی کرد. هۆکارەکەی ئەو بو کە نەجدە سوپاکەی بۆ شەڕ لەوشکانی و دەریا ڕەوانە کرد و بەشەڕکەرانی دەریا زیاتری بەخشی تا شەڕکەرانی وشکانی. عەتیە ناسازگاری خۆی نیشاندا و ئەوی توڕە کرد. نەجدە جوێنی پێدا. ئەو کینەی نەجدەی لەدڵ گرت و بەردەوام خەڵکی دژی ئەو هاندەدا. هەروەها لەگەڵ نەجدە سەبارەت بەپیاوێك قسەیان کرد کە شەراب دەخواتەوە و لەناو سوپاکەی ئەودا شەڕدەکات. نەجدە وتی: پیاوێکی ئازا و بۆ دوژمنان سەختگیرە. پێغەمبەر تەنانەت لەبتپەرستەکان هاوکاری وەردەگرت. عەبدولمەلیك نامەی بۆ نەجدە نوسی و داوای لێکرد ملکەچی فەرمانەکانی بێت و مژدەی پێدا بیکاتە فەرمانڕەوای یەمامە و ئەوەی لەسامان و تالآنی و ئەو خوێنانەی ڕژاندویانە، بەو ببەخشێت. عەتیە ئەمەی کردە رەخنە وتی: عەبدولمەلیك نامەی بۆ ئەنوسی مەگەر ئەوەی سستی و لاوازی لەکار و دینەکەی ئەودا بینی. لێی جیابویەوە و بەرەو عەممان ڕۆیشت.

لەناو ئەوان: دەستەیەك داوایان لەنەجدە کرد تۆبە لەگوناحەکانی خۆی بکات و پەشیمان ببێتەوە. ئەو سوێندی خوارد کە چیتر ئەو کارانە دوبارە ناکاتەوە. دواتر لەمەبەستەکەی خۆی پەشیمان بویەوە و چەند کارێکیتریان لەو بینی کە بەنەشیاویان لەقەڵەمدا. ئەو پشتی کردە هەمو هاوەڵانی. خۆیان لەو دورخستەوە و فەرماندەییان بەکوڕی فەدیك عەبدالله کوڕی سور (یەکێك لەخەڵکانی بەنی قەیس) سپارد. نەجدە هەڵات و خۆی داشارد. ئەبو فەدیك دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد و وتی: ئەگەر گرتتان، بیهێننە لای من. بەئەبو فەدیکیان وت: ئەگەر نەجدە نەکوژیت، خەڵك لەدەوری تۆ بڵاوەی لێدەکەن. لەبەر ئەمە بەجیدی بەدوای نەجدەدا گەڕا. نەجدە لەیەکێك لەدێهاتەکانی حجر خۆی داشاردبو. ئەو خەڵکەی لای ئەوان خۆی دایشاردبو، کەنیزێکیان هەبو کەشەوانە بۆ لای ئەو هاتوچۆی دەکرد. ڕۆژێك ئەو کەنیزە کەمێك لە(بۆن)ی نەجدە هەڵگرت. شوان پرسی: ئەم بۆنە خۆشەت لەکوێ بو. کەنیز ئاگاداری کردەوە. شەوان هاورێکانی ئەبوفەدیکی ئاگادار کردەوە. ئەوان بەدوایدا گەڕان و نەجدە ترسا و وشیار بویەوە. ڕۆشتە لای خاڵەکانی خۆی لەبەنی تەمیم و لەناو ئەوان خۆی حەشاردا. دواتر مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای عەبدولمەلیکی کرد. هاتە ماڵەکەی تا پێشنیارە پێویستەکان بۆ هاوسەرەکەی بکات و ماڵئاوایی لێ بکات. فەدەکیەکان ئاگادار

بونەوە و مەبەستی ئەویان کرد. پیاوێك پێش گەیشتنی ئەوان بەهەڵاتن نەجدەی ئاگادار کردەوە. شمشێرێکی لەدەستا بو. فەدیکی لەئەسپەکەی دابەزی و بەنەجدەی وت: کەس ناتوانێت ئەم ئەسپەی من بگرێت. سواری بە ئەگەری هەیە رزگارت بێت. نەجدە وتی: خوازیاری ژیان نیم. چەندین جار بومەتە نیشانەی کوژران و گیان بەخشین کە ئەمەیان خراپترینیان نیە. هاورێکانی ئەبوفەدیك دەوریان گرت و کوشتیان. پیاوێکی رێزدار و ئازا بو. دەیوت:

و ان جر مولانا علینا جریرة　　　　صبرنا لها ان الکرام الدعایم

یانی: ئەگەر سەروەرەکەمان پێشهاتێکی بەئازارمان بەسەردا بێنێت، خۆڕاگری دەکەین و گەورەزادە رێزدارە بەهێزەکان دەبین.

کاتێك نەجدە کوژرا، مەرگی ئەو دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەبو فەدیکی رەنجاند و لەدەوری ئەو بلاّو بونەوە. موسلیم کوڕی جوبەیر دژی ئەو شۆڕشی کرد و دوانزە جار بەکێرد لێیدا. موسلیمیان کوشت و ئەبو فەدیکیان بۆ ماڵەوە برد و باش بویەوە.

## دانانی مەصعەب کوڕی زوبەیر وەك فەرمانداری مەدینە

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی زوبەیر، براکەی عوبەیدە کوڕی زوبەیری لەمەدینە لابرد و براکەیتری مەصعەب کوڕی زوبەیر وەك فەرماندار دەست نیشان کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە کە عوبەیدە قسەی بۆخەڵك کرد و وتی: ئێوە بیستوتانە کە خوا خەڵکێکی لەبری وشترێك کەزیاتر لەپێنج درەم بەهاکەی ئەبو، چون ئەشکەنجە کرد (مەبەستی خەڵکەکەی صالحی پێغەمبەر بو). ئەویان بە (هەڵسەنگێنەری وشتر) ناوبرد. ئەم وتە بەگوێی عەبداللەی برای گەیشت و لەبەر ئەمە لەسەر کار لایبرد و مەصعەبی لەجیاتی ئەو دانا.

چاککردنەوەی کەعبە لەسەر دەستی کوڕی زوبەیر

کاتێك ماڵی کەعبە لەکاتی هێرشی خەڵکانی شام بۆ سەر عەبداللە کوڕی زوبەیر لەسەردەمی یەزید، ئاگری گرت و سوتا، کوڕی زوبەیر بەهەمانشێوە هێشتیەوە تا ببێتە هۆکاری سەرکۆنە کردنی دوژمنان و خەڵکانی شام. کاتێك یەزید مرد و کاروبارەکان بۆ کوڕی زوبەیر ئارامیان گرت، دەستی بەدروست کردنەوەی کرد. فەرمانیدا کە لەگەڵ خاك تەختیان کرد. دیوارەکانی بەهۆی هاویشتنی بەرد لەلایەن کەشکەنجیرەکانەوە خوار

ببون. ئەو بەردی ڕەشی لەشوێنەکەی خۆیدا دانایەوە. خەڵك لەپشتەوە بەدەوری کەعبەدا دەسورانەوە. ئەو بۆ کەعبە دیوارێکی دروست کرد و بەردەکەی بردە ناوی. بەڵگەیەکی بەم شێوەی هێنایەوە کە پێغەمبەری خوا بەعایشەی وتبو: ئەگەر خەڵکەکەی تۆ تازە لەناباوەڕیەوە باوەڕیان بەئیسلام نەدەهێنا، کەعبەم بۆ شێوازی کەعبەکەی ئیبراهیم دەگەڕاندەوە و بەردی ڕەشم دەبردە ناوەوە.

کوڕی زوبەیر زەوی هەڵکەند و ڕەگە بەهێزەکانی (هاوشێوەی وشترە خەوتوەکان)بینی. تاشەبەردێکی هەڵکەند و بروسکەیەك هاتەدەر. وتی: بەهەمان شێوە بیهێڵنەوە. دودەرگای بۆ دروست کرد کە لەیەکیانەوە دەڕۆشتنە ناو و لەیەکیانەوە دەڕۆشتنەدەر. دەستەیەك دەڵێن: دروست کردنەکەی لەساڵی ٦٤/ ٦٨٣- ٦٨٤ زایینی رویدا.

## شەڕ لەنێوان کوڕی خازم و تەمیمیەکان

لەم ساڵەدا لەنێوان کوڕی خازمی سولەمی و بەنی تەمیم لەخوراسان شەڕ دەستی پێکرد. هۆکارەکەی ئەوەبو کە تەمیمیەکانی نیشتەجێی خوراسان، هاوکاری کوڕی خازمیەکان کرد بۆ شەڕدژی بەنی ڕەبیعە. پێشتر ئاماژەمان بەم روداوەدا. کاتێك دەستی بەسەر هەمو خوراساندا گرت، لەگەڵ بەنی تەمیم ڕێگەی نامیهرەبانی و ستەمکاری گرتەبەر. ئەو کوڕەکەی محەممەدی لەهەرات وەك فەرماندار دەست نیشان کردبو و بوکەیر کوڕی وەساجی کردبوە سەرکردەی پاسەوانەکانی و شەمسا کوڕی دساری عوتاردی پەیوەستی ئەو کردبو. دایکی محەممەد تەمیمی بو. کاتێك بەنی تەمیمی لەخۆی دورخستەوە، ڕۆشتنە لای کوڕەکەی محەممەد لەهەرات. کوڕی خازم بۆ محەممەدی کوڕی و بوکەیر و شەماس نامەی نوسی و فەرمانی پێدان ئەوان لەهەرات دوربخەنەوە. شەماس لەگەڵ بەنی تەمیم بەرێکەوت بەڵام بوکەیر لەوێ دورخرایەوە. ئەوان لەسەرزەمینەکانی هەرات مانەوە. بوکەیر پەیامی بۆ شەماس ناردە کە: من سی هەزار (دەرم یا دینار) م بەتۆدا. بەهەر پیاوێك لەبەنی تەمیم هەزار دەرەم یا دینار، ببەخشە لەسەر ئەو بنەمای کەبگەڕێنەوە.

ئەوان رازی نەبون و مانەوە و چاودێری محەممەدیان دەکرد. ڕۆژێك بۆ راو ڕۆشتەدەر. ئەویان گرت و بەتوندی بەستیانەوە و سەراسەری شەو خواردیانەوە و میزیان بەودا دەکرد. شەماس وتی: ئێستا کە بەم شێوە ئەشکەنجەتان کرد، بیکوژن تا ئەم کارە تۆڵەی

دو هاورێکەتان بێت کە ئەو بەقامچی ئەوانی کوشت. ئەو بەقامچی ئەوەندەی لەدوپیاو لەبەنی تەمیمدا بو  کە گیانیاندابو. ئەوان مەبەستی ئەوەیان کرد بیکوژن. جەهیان کوڕی مەشجەعەی زەببی رێگەی ئەم کارەی لێگرتن و خۆی خستە سەر ئەو. ئەوان رازی نەبون و محەممەدیان کوشت. کوڕی خازم رێزی لەم کارەی جەهیان گرت و ئەوی (لەرۆژی شەڕی فرتنا کە خەڵکانی کوشتار کرد،) نەکوشت.

ئەو کەسانەی محەممەدیان کوشت، دوپیاو بون کە ناوی یەکیان عەجەلە (خێرایی) وناوی ئەویتریان (کەسیب) (بەدەست هێنەر) بو. کوڕی خازم وتی: فێزەونە ئەوەی کەسیب بۆ خەڵکەکەی خۆی بەدەستی هێنا و عەجەلە لەزیان گەیاندن بەخەڵکەکەی خۆی پەلەی کرد.

تەمیمیەکان رویان لەمەرو کرد و حەریش کوڕی هیلالی قوریعیان وەك فەرماندەی خۆیان دەست نیشان کرد و زۆربەی ئەوان بڕیاریاندا لەگەڵ کوڕی خازم شەڕ بکەن. حەریش کوڕی هیلال بۆ ماوەی دو ساڵ لەگەڵ عەبدالله کوڕی خازم شەڕی کرد. کاتێك شەڕ درێژ بویەوە، حەریش هات و کوڕی خازم شەڕی کرد. کاتێك شەڕ درێژەی کێشا، حەریش هاتەدەر و بەکوڕی خازمی وت: شەڕ لەنێوان ئێمەدا درێژ بۆتەوە، بۆخەڵکەکەی خۆت و خەڵکەکەی من کوشتار دەکەیت؟ شەڕ لەگەڵ من بکە تا هەرکام لەئێمە کە ئەویتری کوشت، ئەم سەرزەمینە بۆ ئەو بێت.

کوڕی خازم پێی وت: دادپەروەریە. روبەروی بویەوە. ئەم دوانە لەیەکیاندا و هێرشیان کردە سەریەك و هاوشێوەی دو شێری نێر پەلاماری یەکیان دەدا. هیچ کامیان نەیتوانی ئەویتر لەناو ببات. دواتر کوڕی خازم بۆ ساتێك ئاگا بو و حەریش بەشمشێر لەناوچاویدا بەشێوەیەك پێستەکەی بەروخساریەوە هەڵواسرا. کوڕی خازم دەستی کردە ملی ئەسپەکەی خۆی و روی کردە هاوڵانی. دواتر لەکاتی بەرەبەیان هێرشی کردە سەرئەوان. هەردولای شەڕکەر دوای چەند رۆژێك شەڕ کردن سەرئەنجام بێزار بون. ئەولایان بو بەسێ دەستە: دەستەیەك لەوان هاورێ لەگەڵ بەحیر کوڕی وەرقا  بەرەو ئەیشابور رەوانە بو، دەستەیەکیتریان بۆ ناوچەیەکیتر و دەستەیەك کە حەریش لەناویاندابو، بەرەو مەرورود رۆیشتن. کوڕی خازم شوێنی کەوت و ئەوی لەگەڵ دوانزە پیاو لەگوندێك بەناوی مەلحەمە دۆزیەوە. هاورێکانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکردبو.

ئەوان لەوێرانەیەکدا بون. یەکێك لەکۆیلەکانی کوڕی خازم هێرشی کردە سەر حەریش و حەریش پەلاماریدا بەلاَم نەیتوانی هیچ کارێك بکات. حەریش بەیەکێك لەپیاوەکانی خۆی وت: شمشێرەکەی من کاریگەری لەسەر کەرەستەی شەڕی ئەو دانانێت، دارێکم پێ بدە. پیاو تێلاَیەکی لەداری سنجو پێدا و بەوە داترە لەکۆیلەکەیدا و ئەوی نیوە گیان خستە سەرزەوی. دواتر بە کوڕی خازمی وت: شارەکانم بۆ تۆ بەجێهێشت، لەگیانی من چیت دەوێت؟ وتی: دەگەڕێیتەوە. وتی: ناگەڕێمەوە. لەسەر ئەم بنەمایە رێککەوتن کە لەخوراسان کۆچ بکات و دژی ئەو شەڕ نەکات. کوڕی خازم چل هەزار درەمی پێ بەخشی. حەریش درگای کۆشکی بەروی ئەودا کردەوە و کوڕی خازم ڕۆشتبە ناوی و بەلێنیدا قەرزەکەی بدات. ئەو دوانە بۆ ماوەیەکی درێژ گفتوگۆیان کرد.

لەزیانی ئەو زەربەی بەر کوڕی خازم کەوت، لەتە گۆشتێك بەروخساریەوە ناوێزان بو. حەریش هەڵیگرت و خستیەوە·شوێنەکەی خۆی. کوڕی خازم وتی: دەست پیاهێنانی ئەمرۆت لەدەست پیاهێنانی دوێنێ نەرمترە. حەریش وتی: داوای بەخشین لەخوا و لەتۆ دەکەم، سوێند بەخوا ئەگەر شوێن پێکەم لەزینی ئەسپەکە نەپچڕابو، شمشێرەکەم سەرتی دەقلیشاند. حەریش سەبارەت بەم روداوە وتی:

| | |
|---|---|
| ازال عظم ذراعی عن مرکبه | حمل الردینی فی الادلاج بالسحر |
| حولین ما اغتمضت عیینی بمنزلة | الا و کفی و ساد لی علی حجر |
| بزی الحدید و سر بالی اذا هجعت | عنی العیون محال القارح الذکر |

یانی: هەلگرتنی ئەو ڕمە بڵندەی رەدینی ( ژنێك کەلە سەردەمی جاهلی ڕمەکانی هەڵدەسەنگاند) لەکاتی شەوڕەوی لەدڵی بەرەبەیان، ئێسقیانی منی لەبەندی جلەوەکم و شوێن پێکەم خزاند. دو ساڵی تەواو کە تیایدا پێڵوەکانم نەخرانە سەر یەك مەگەر ئەوەی کە سەرینەکەم بەردێك بو. جلەکانم ئاسن و کاتێك چاوەکانم چیتر پاسەوانی منیان نەدەکرد، پانتۆڵەکەم، کەرەستەی فێڵبازی و یاخیگەری ئەو تیژپێ نێرە وەسف کراوە بو.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا تاعونێکی گشتی و مەرگهێنەر بەسرەی گرتەوە. فەرمانداره‌کەی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر بو. دەستەیەکی فراوان لەخەڵکان لەناوچون. دایکی عوبەیدالله مرد و کەسیان دەست نەکەوت لاشەکەی هەڵگرێت و بەخاکی بسپێرن. هەرچەندە فەرماندار بو، کەسانێکی بەکرێ گرت تا لاشەی دایکیان هەڵگرت و بەخاکیان سپارد.

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد. فەرمانداری مەدینە مەصعەب کوڕی زوبەیر، کوفە کوڕی موتیع، لەبەسرە حارس کوڕی رەبیعەی مەخزومی و لەخوراسان عەبدالله کوڕی خازم فەرمانڕەوا بون.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عاصی سەهمی مرد. ئەو لەکۆتایی ژیانی کوێر ببو. مەرگی ئەو لەمیسر بو. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٨/ ٦٨٧- ٦٨٨ زایینی مرد.

## روداوەکانی ساڵی شەست و شەشی کۆچی ( ٦٨٥ – ٦٨٦ زایینی )

## شۆڕشی موختار لەکوفە

لەم ساڵەدا لەچواردەی رەبیع الاول / ١٩ ئۆکتۆبەری ٦٨٥ زایینی موختار لەکوفە شۆڕشی کرد و عەبدالله کوڕی موتیع کارگوزاری عەبدالله کوڕی زوبەیری لەوێ دەرپەڕاند.

هۆکاری ئەم کارەی ئەوەبو کەکاتێك سولەیمان کوڕی سوردی خوزاعی و دەستەیەك لەهاورێکانی کوژران، پاشماوەی هاورێکانی گەڕانەوە بۆ ناو کوفە. کاتێك گەیشتن، بینیان موختار لەزینداندایە. عەبدالله کوڕی یەزیدی حەتەمی و ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەلحە ئەویان خستبوە زیندان. پێشتر ئاماژەمان بەم روداوەدا. ئەو لەزیندانەوە نامەی نوسی و سوپاسی ئەوانی کرد و مژدەی سەرکەوتنی پێبەخشین و خۆی بەوان ناساند کە ئەو کەسەیە محەممەد کوڕی عەلی (ناسراو بەناو و نیشانی کوڕی حەنیفە) فەرمانی پێداوە بۆ تۆڵەی خوێنی حسین شۆڕش بکات. ئەم کەسانە نامەکەیان خوێندەوە: ریفاعە کوڕی شەداد، موسەنا کوڕی موخەریبەی عەبدی، سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان، یەزید کوڕی ئەنس، ئەحمەر کوڕی شەمیتی ئەحمەسی، عەبدالله کوڕی شەدادی بەجلی و عەبدالله کوڕی کامل. کاتێك نامەکەی ئەویان خوێندەوە، کوڕی کاملیان بۆ لای ئەو رەوانە کرد و پێیان وت: ئێمە لەبارودۆخێکداین کە تۆ شادمان دەکات، ئەگەر بخوازیت دێینە لای تۆ و لەزیندان دەتهێنینەدەر. نێردراو رۆیشت و پێی راگەیاند و ئەو شادمان بو و پەیامی بۆ ئەوان نارد کە: من لەم رۆژانەدا بزوتنەوەکەی خۆم دەست پێدەکەم.

موختار کەسی بۆ لای عەبدالله کوڕی عومەر رەوانە کردبو و پێی وتبو کە: من، بەستەم خراوەتە زیندان. داوای لێکرد تا لای عەبدالله کوڕی یەزید وئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەلحە نێوەنجیگەری بکات. کوڕی عومەر سەبارەت بەو نامەیەکی بۆ ئەو دوانە نوسی کە رازی بون و ئەویان ئازاد کرد و بەڵێن و سوێندیان لێ وەرگرت کە مەبەستی زیان گەیاندن بەوان نەکات و تا ئەو کاتەی ئەمان لەم شارەدا فەرمانڕەوایی دەکەن، شەڕ دژی ئەوان دەست پێ نەکات. ئەگەر ئەم کارە بکات، سوێندی لەسەر بێت کە هەزار سەر مەڕی قوربانی لەکەعبەدا سەربېڕێت و هەمو کۆیلەکانی لەنێر و مێ ئازاد بن.

کاتێك هاتەدەر، لەماڵەکەی خۆیدا مایەوە و بەوکەسانەی بۆچونەکانیان یەك بو، وتی:

خوا کوشتاریان بکات، چەن گێژ و نەزانن خەڵکان کە گومان دەکەن من ڕێز لەبەڵێن و سوێندەکەی خۆم دەگرم! بەڵام سوێندی من بەخوا، کاتێك کە سوێند دەخۆم، بەباشی دەڕوانم و ئەگەر کارێکی باشتر ببینم، تاوانی سوێندەکەم دەدەم. ئێستا شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان باشترە لەوەی دەستیان لێ هەڵبگرم. بەڵام سەربڕینی قوربانیەکان و ئازاد کردنی کۆیلەکان، ئاسانترە لەتف کردنە سەر زەوی. حەز دەکەم ئارەزوەکەم بێتەدی و هیچ کۆیلەیەکم نەبێت.

دواتر شیعەکان هاتوچۆیان بۆ لای ئەو دەست پێکرد و بڕیاریاندا و بەفەرمانڕەوایی ئەو رازی بون. هاورێکانی بەردەوام زیادیان دەکرد و بەهێز دەبون تا کوڕی زوبەیر عەبداللە کوڕی یەزید وئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحەی لەسەر کار لابرد و لەجیاتی ئەو دوانە، عەبداللە کوڕی موتیعی وەك فەرمانداری کوفە ڕەوانە کرد. بەحیر کوڕی ڕەستان، چاوی پێی کەوت و ئەمە لەکاتێکدابو بەرەو کوفە دەڕۆیشت. پێی وت: ئەمشەو مەڕۆ چونکە (مانگ لەچنگارە، مانگ لەسەر دو شاخی مەڕەکانە). موختار وتی: مەگەر ئەوە نیە کە مەبەستی شەڕکردنمان هەیە؟ ئەو سەرکەوتنی بەهەمان شێوە کەدەمیویست، بەدەستی هێنا. لەوەبەدوا ئەزمونی (سەرکەوتن) بو بەبەشێك لەوتارەکەی ئەو چونکە پیاوێکی بێ ئەندازە بوێر بو.

ئیبراهیم بۆ مەدینە گەڕایەوە و باجەکەی تەسلیم نەکرد. لەبەر ئەمە ئاژاوەیەك دروست بو بەڵام کوڕی زوبەیر چاوپۆشی کرد.

هاتنی کوڕی موتیع لەمانگی ڕەمەزان، پێنج ڕۆژ بۆ کۆتایی/ ٢٥ ئاوریلی ٦٨٦ زایینی بو. ئەو ئەیاس کوڕی مەزاربی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دەست نیشان کرد و فەرمانی پێدا کردارێکی باشە بکاتە پیشە و سەختگیری لەسەر گومان لێکراوان بکات. کاتێك گەیشت، ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و قسەی بۆئەوان کرد و دواتر وتی: دوای سلاو، سەروەری باوەڕداران، کوڕی زوبەیر، منی کردۆتە فەرماندەی شار و سنورەکانی ئێوە و فەرمانی پێداوم باجتان لێ وەربگرم و زیادەی بەخشش لای ئێوە نەبەمەدەر مەگەر بەرەزامەندی خۆتان. دەبێت پێشنیارەکانی عومەر کوڕی خەتاب لەکاتی مەرگ سەبارەت بەئێوە بەکار ببەم و درێژە بەشێوازەکەی کوڕی عەفان بدەم. لەخوا بترسن وبۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێنەوە و ناسازگاری مەکەنە پیشە و نەزانەکانتان دەمکوت بکەن

چونکە ئەگەر نەیکەن دەبێت تەنیا خۆتان سەرکۆنە بکەن و لەسەرکۆنە کردنی من خۆتان بەدور بگرن. سوێند بەخواوەندی خوا، نەخۆش و کردارخراپ پێشێل دەکەم و یاخیە کردار خوارەکان راست دەکەمەوە.

سایب کوڕی مالکی ئەشعەری هەستا و وتی: بردنی بەخششە زیادەکانی ئێمە، شایەتی دەدەین کە رازی نین لێرەوە بۆ شوێنێکی دیکەی ببەن و تەنیا دەمانەوێت بەسەر خۆماندا دابەش بکرێت. هەروەها دەمانەوێت فەرمانڕەوایەتی کردنی ئێمە لەسەر شێوەی عەلی کوڕی ئەبی تالب بێت کە تا دوایین ساتەکان لەسەرزەمینەکانی ئێمە ئەو شێوازەی بەکار برد. ئێمە پێویستمان بەشێوازی عوسمان سەبارەت بەبەخشش و گیان و سامانی خۆمان نیە. هەروەها بەشێوەی عومەر کوڕی خەتاب رازی نابین هەرچەند لەنێوان ئەو دو شێوازە، ئاسانترینیان بو. بەڵێ، ئەو بەشێوەیەکی چاك هەڵس وکەوتی لەگەڵ خەڵکان دەکرد.

یەزید کوڕی ئەنس وتی: سایب راست و چاکە دەکاتە پیشە. کوڕی موتیع وتی: لەناو ئێوەدا لەسەر بنەمای ئەو شێوازەی دەتانەوێت، هەڵس و کەوت دەکەین.

دواتر ئەیاس کوڕی مەزارب ڕۆشتە لای کوڕی موتیع وپێی وت: سایب کوڕی مالك لەگەورەکانی دەستەکەی موختارە. کەسێك بۆ لای موختار رەوانە بکە تا بێتە لای تۆ. کاتێك هات، بیخە زیندان تا کاروبارەکانی خەڵك سامان بدرێت. دەڵێی کاروبارەکان بۆ ئەو ئارامیان گرتوە و هەمو ئەم شارە لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئەودایە.

کوڕی موتیع، زایدە کوڕی قودامە و حسین کوڕی عەبدالله بورسمی لەهەمەدان بەدوای موختار رەوانە کرد کە وتیان: وەرە بۆ لای فەرماندار. ئەو مەبەستی ڕۆشتنی کرد و (فالی بەقورئان گرتەوە) و ئەم ئایەی خوێند: کاتێك دەستەی ناباوەڕان فێڵ بەکار دەبەن، تا بتگرن یا بتکوژن یا دورت بخەنەوە، فێڵیان بەکار دەبرد و خوا بەتاڵی دەکردەوە و خوا باشترینی چارەسەرکەرانە (انفال/ ٨/ ٣٠). موختار جل و بەرگی خۆی فرێدا و وتی: پێستەیەکم پیا بدەن چونکە (تا)م لێهاتوە، سەرمام دەبێت. بڕۆنە لای فەرماندار و لەنەخۆشیەکەی من ئاگاداری بکەنەوە. ئەو دوانە گەڕانەوە بۆ لای کوڕی موتیع و ئاگاداریان کردەوە. کوڕی موتیع دەستی لێ هەڵگرت.

موختار کەسی بەدوای هاورێکان و شوێنکەوتەکانی خۆی رەوانە کرد و ئەوانی

لەماڵەکانی دەوروبەری خۆی جێگە کردەوە. پیاوێك لەیارانی شبام (هۆزێك لەهەمەدان) هات. پیاوێکی ڕێزدار بەناوی عەبدولرەحمان کوڕی شورەیح بو. ئەو چاوی بەم کەسانە کەوت: سەعید کوڕی مەنقەزی سوری، سیعر کوڕی ئەبی سیعری حەنەفی، ئەسوەد کوڕی جەرادی کێندی و قودامە کوڕی مالکی جوشەمی. بەوانی وت: موختار دەیەوێت بەهاوکاری ئێمە بزوتنەوەکەی خۆی دەست پێ بکات. نازانین ئایا کوڕی حەنیفە ئەوی ڕەوانە کردوە یا نە. ئێمە بۆ لای کوڕی حەنیفە ببەن تا پێی بڵێین موختاری لەسەر چ کردار و یاسایەك بۆ لای ئێمە ڕەوانە کردوە. ئەگەر فەرمانمان پێدات، شوێنی بکەوین، ئەو کارە دەکەین و ئەگەر ڕێگەمان لێ بگرێت، لەو خۆمان بەدور دەگرین. سوێند بەخوا نابێت لەم جیهانە هیچ شتێك ڕێزدارتر لەمانەوەمان بەڕاستی لەسەر دینەکەمان بێت. پێیان وت: ڕاستت وت.

ئەوان بۆ لای کوڕی حەنیفە بەڕێکەوتن و کاتێك ڕۆشتنە لای، لەحاڵی خەڵکان پرسیاری کرد و ئەوان بارودۆخی خۆیان بۆ باس کرد و مەبەستەکەی خۆیان شاردەوە. ڕێگە و شێوازی موختار کوڕی ئەبی عوبەیدەیان بۆ باس کرد کە چی بەوان وتوە. داوایان لە کوڕی حەنیفە کرد فەرمان بدات تا شوێنی بکەون. کاتێك لەوتارەکەیان تەواو بون، کوڕی حەنیفە سوپاسی خوای بەجێهێنا و لەپێشی بنەماڵەی پێغەمبەری بیرخستنەوە و پرسەی کوژرانی حسینی ئاشکرا کرد. دواتر بەوانی وت: بەڵام ئەوەی سەبارەت بەتۆڵە سەندنەوەی خوێنی ئێمە ئاماژەتان پێدا، سوێند بەخوا ئارەزو دەکەم کە خواوەند بەهێزی هەر بەندەیەك لەبەندەکان کەبیەوێت، تۆڵەی ئێمە لەم ستەمکارانە وەربگرێت. ئەگەر نەیدەویست، دەیوت: شوێنی مەکەون.

ئەوان گەڕانەوە و بینیان خەڵکانێك لەشیعەکان (کەپێشتر ئاگاداریان کردبونەوە) چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەوانن. ئەم کارە لای موختار ناپەسەند و دەترسا ئەوان پەیامێك بێنن کەشیعەکان لەدەوری ئەو دوربخاتەوە. کاتێك گەیشتنە کوفە، پێش ڕۆشتن بۆ ماڵەکانی خۆیان، ڕۆشتنە لای موختار. بەوانی وت: ها، چ هەواڵ و پەیامێکتان پێیە؟ گومانتان دروست کرد و ئاژاوەتان نایەوە! وتیان: فەرمانمان وەرگرت تا پشتیوانی تۆ بکەین. وتی: خوا گەورەیە! شیعەکان لەدەوری من کۆبکەنەوە. ئەوانەی نزیك بون، هاتن. بەوانی وت: چەند کەسێك ویستیان ڕاستی ئەوەی من باسی دەکەم، لەڕێبەری

رزگار بو (سوشیانس) بپرسن. بۆ ئەم کارە ڕۆشتنە لای. سەبارەت بەوەی من باسی دەکەم، پرسیاریان کرد و ئەوانی ئاگادار کردەوە کە وەزیر و پشتیوان و نێردراوی ئەوم. فەرمانی بەنێوەدا فەرمانەکانی من جێبەجێ بکەن و لەوەی داوای دەکەم، گوێڕایەڵ بن. مەبەستی من ئەوەیە کە: دەبێت لەگەڵ پێشێل کەرانی دین و ڕاستی شەڕ بکەین و تۆڵەی خوێنی بنەماڵەی پێغەمبەر وەربگرین.

عەبدولرەحمان کوڕی شوەریح هەستا و باسی ڕۆشتنی خۆی بۆ لای کوڕی حەنیفەی گێرایەوە و زیادی کرد کە کوڕی حەنیفە فەرمانی پشتیوانی و شوێنکەوتنی موختاری پێداون. بەوانی وت: ئەوانەی لێرەن، ئەم پەیامە بۆ ئەو کەسانەی لێرە ئامادە نین، بگێڕنەوە. ئامادە بن و هێزەکانی خۆتان کۆبکەنەوە.

شیعەکان لەدەوری کۆبونەوە. شەعبی و باوکی شورەحبیل لەناو ئەواندا بون، کاتێك بۆ دەسپێکی بزوتنەوەکەی ئامادە بو، یەکێك لەهاوڕێکانی پێی وت: سەرانی کوفە، بۆ شەڕ لەگەڵ ئێوە لەگەڵ کوڕی موتیع یەکیان گرتوە. ئەگەر ئیبراهیم کوڕی (مالك) ئەشتەر لەگەڵ ئێمە یەك بگرێت و وەڵامی بانگەوازەکەی ئێمە بداتەوە، هیوادارده‌بین بتوانین بەسەر دوژمنەکەی خۆمان سەرکەوین چونکە ئەو جوامێرێکی گەورە و ڕێزدارە وخزم و کەس و کاری بەهێز و ئامادە بۆ شەڕی هەیە.

موختار بەوانی وت: بڕۆنە لای و بانگەوازەکەی ئێمەی پێ ڕابگەیێنن. ئەوان هاوڕێ لەگەڵ شەعبی ڕۆشتنەدەر وبەسەرهاتەکەی خۆیان بۆ باس کرد و داوایان لێکرد لەم کارەدا هاوکاریان بکات. بیریان خستەوە کە باوکی چەند لەخۆشەویستی عەلی و بنەماڵەکەی بەهێز و خۆڕاگر بوە. بەوانی وت: وەڵامی بانگەوازەکەی ئێوە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسین و بنەماڵەکەی دەدەمەوە بەو مەرجەی من بکەنە فەرمانڕەوا و ڕێبەری خۆتان. پێیان وت: بۆ ئەم کارە شیاویت بەڵام هیچ ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بەمەبەستەکەت نیە. چونکە موختار بەنوێنەرایەتی سۆشیانس هاتۆتە لای ئێمە. ئەو بۆ شەڕ دیاری کراوە و فەرمانیان بەئێمەداوە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بین. ئیبراهیم بێدەنگ بو و وەڵامی بانگەوازەکەی ئەوانی نەدایەوە. گەڕانەوە و موختاریان لەم بەسەرهاتە ئاگادار کردەوە. ئەو سێ ڕۆژ چاوەڕێی کرد ودواتر لەگەڵ دە کەس و چەند کەس لەهاوڕێیانی خۆی، لەناویان (شەعبی و باوکی)

ڕۆشتە لای ئیبراهیم. ڕۆشتنە لای و ئیبراهیم فەرشی بۆ ڕاخستن. دانیشتن و موختار لەگەڵ ئەو لەسەر یەك فەرش دانیشت. موختار پێی وت: ئەمە نامەی محەممەد کوڕی عەلی سەروەری باوەڕدارانە کە باشترینی خەڵکانی ئەمڕۆی سەر زەوی و کوڕی باشترین خەڵکانی دوێنێی سەرزەویە و ئەمە دوای پێغەمبەر و نێردراوەکانی خوایە. داوا لەتۆدەکات هاوکاری و پشتیوانی ئێمە بکەیت.

شەعبی دەڵێت: نامەکە بەمن بو، کاتێك موختار لەوتارەکەی تەواو بو، بەمنی وت: نامەکەی پێ بدە. شەعبی نامەکەی پێدا کەخوێندیەوە و بینی بەم شێوەیە نوسراوە: لەمحەممەد (سۆشیانس) بۆ ئیبراهیم کوڕی مالکی ئەشتەر. سڵاو لەتۆ. من سوپاسی خوا دەکەم کە جگە لەو خوایەك نیە. دوای سڵاو، من وەزیر و نێردراوی خۆم هەڵبژارد و بۆ لای ئێوەم ڕەوانە کرد و فەرمانم پێدا لەگەڵ دوژمنەکانم شەڕ بکات و تۆڵەی خوێنی کەسانی بنەماڵەکەم بکاتەوە. ئێستا تۆ خۆت و خەڵکەکەت و فەرمانبەرانت هەستە کە ئەگەر وەڵامی داواکاریەکەم بدەیتەوە، بۆ ئەم کارەت لای من پێگەیەکی بەرزت پێدەبڕێت و هەوساری ئەسپەکان و هەمو سوپا هێرش بەرەکان و کەران تا کەرانی هەر شارێك و تەختی وتاردان و سنورێك دورتر لەکوفە تا دورترین شوێنی شام، کەبەسەریدا زاڵ ببێت، بۆ تۆبێت.

کاتێك لەخوێندنی نامەکە تەواو بو، وتی: پێش ئەمڕۆیش نامەی کوڕی حەنیفە بۆ ئێمە هاتوە و من نامەم بۆ نوسی و ئەو تەنیا بەناوی خۆی و ناوی باوکیەوە نامەکانی بۆ من دەنارد. موختار وتی: ئەوە ڕۆژگارێك بوە وئەمڕۆ ڕۆژگارێکیتر. وتی: کەواتە کێ دەزانێت ئەم نامە بۆ منە؟ دەستەیەك لەهاوڕێکانی شایەتیاندا کە ئەم کەسانە لەناویاندا بون: زەید کوڕی ئەنس، ئەحمەر کوڕی شەمیت، عەبداللە کوڕی کامل و دەستەیەك لەوان جگە لەشەعبی.

کاتێك شایەتیاندا، ئیبراهیم لەسەروی فەرشەکە هاتەخوار و موختاری لەسەرەوە دانیشاند و بەیعەتی لەگەڵ کرد. دواتر لای ئەو ڕۆشتن. ئیبراهیم بەشەعبی وت: بینیم لەگەڵ خەڵك شایەتیت نەدا، نە تۆ نە باوکت. ئایا گومان دەکەیت ئەوان لەسەر بنەمای ڕاستی و دروستی شایەتیاندا؟ پێی وت: ئەوان قوڕئان خوێنە گەورەکان و پیرانی شارەکان و سوارکارانی عەرەبن وکەسانێکی وەك ئەوان تەنیا ڕاستی دەهێننە سەرزمان.

ئەو ناوەکانی ئەوانی نوسی و لای ئەو بەجێی هێشت. ئیبراهیم کەسان و خزمەکان و فەرمانبەرانی خۆی بانگ کرد و هاتوچۆی بۆ لای موختار دەست پێکرد، ئەوان کارەکانی خۆیانیان سامان دەدا. بڕیاریاندا شەوی پێنج شەممە چواردەی رەبیع الاولی ساڵی شەست و شەش / ١٩ ئۆکتۆبەری ٦٨٥ زایینی بزوتنەوکەی خۆیان دەست پێبکەن.

کاتێك ئەو شەوە گەیشت، ئیبراهیم نوێژی شەوی لەگەڵ هاوەڵانی خۆی خوێند و دواتر مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای موختاری کرد. خۆی و هاورێکانی جل و بەرگی شەڕیان لەبەر کردبو. ئەیاس کوڕی مەزارب ڕۆشتە لای کوڕی موتیع و پێی وت: موختار ئەمشەو یا سبەی شەو بەناچاری بزوتنەوەکەی دەست پێدەکات، من کوڕەکەم بۆ کوناسە رەوانە کرد. ئەگەر بۆ هەر گەرەکێك گەورە پیاوێك لەهاورێکانت هاورێ لەگەڵ دەستەیەك شەڕکەر رەوانە بکەیت، موختار و هاورێکانی ترسیان لێ دەنیشێت.

کوڕی موتیع ئەم کەسانەی رەوانە کرد و فەرمانی بەهەرکامیاندا: خەڵکەکەی خۆتان لەم کارە دور بخەنەوە و سەبارەت بەم پەیامە هیچ شتێك بەکەس مەڵێن: عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی بۆ گەڕەکی سەبیع، کەعب کوڕی ئەبی کەعبی خەصعەمی بۆ گەڕەکی بشر، زەحر کوڕی قەیسی جوعەفی بۆ گەڕەکی کێندە، عەبدولرەحمان کوڕی میخنەف بۆ گەڕەکی سایدیان، شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن بۆ گەڕەکی سالم، یەزید کوڕی رویەم بۆ گەڕەکی موراد. رایسپاردن تا وشیار بن تا لەشوێنەکانیانەوە زیانیان بەرنەکەوێت. کەسی بۆ لای شەبس کوڕی ریبعی بۆ شەبخە (زەوی سوێرەڵان) رەوانە کرد و وتی: کاتێك دەنگی منت بیست، رەوانە ببە.

ڕۆشتنەدەرەوەی ئەوان بەرەو (جەبابیین) لەرۆژی دوشەممەدا بو. ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر لەشەوی سێ شەممە هاتەدەر و بەرەو لای موختار بەرێکەوت. ئاگاداریان کردەوە کەجەبابیین لێوانلێوە لەپیاوە شەڕکەرەکان و ئەیاس کوڕی مەزارب هاورێ لەگەڵ پاسەوانەکان، بازار و کۆشکیان (بۆ هێرش بردن یا پارێزگاری کردن) بەپیاوە شەڕکەرەکان تەنیوە. لەپیاوەکانی نزیکەی سەد زرێ پۆشی هەڵگرت کەهەمویان زرێیان پۆشیبو. هاورێکانی پێیان وت: لەم رێگا خۆت بەدور بگرە. وتی: سوێند بەخوا بێ چەند و چون لەناو بازار و لای کۆشکەوە تێدەپەڕم و دوژمنان دەترسێنم و ریسوایی و ناتەوانی ئەوان لەبەرابەر خۆمان ئاشکرا دەکەم.

ئەو لەدەروازەی پیل لای ماڵی عەمرۆ کوڕی حورەیس تێپەڕی کرد. ئەیاس کوڕی مەزارب هاوڕێ لەگەڵ پاسەوانەکان روبەروی ئەوان بونەوە. وتیان : کێن؟ ئیبراهیم وتی: ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر. ئەیاس وتی: ئەم خەڵکەی لەگەڵ تۆن، کێن؟ ئێوە چیتان دەوێت؟ رێگە نادەم بڕۆیت تا دەتبەمە لای فەرماندار. ئیبراهیم وتی: رێگە بکەرەوە. ئەیاس وتی: نایکەمەوە. پیاوێك بەناوی ئەبو قەتن لەهەمەدان لەگەڵ ئەیاس کوڕی مەزارب بو کە رێزی لێدەگرت و هاوڕێی کوڕی ئەشتەر بو. کوڕی ئەشتەر پێی وت: ئەی ئەبو قەتن، وەرە لای من. ئەبو قەتن لێی نزیك کەوتەوە. ئەبو قەتن گومانی دەکرد ئیبراهیم داوای لێدەکات تا لەنێوان خۆی و ئەیاس نێوەنجیگەری بکات. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، ڕمەکەی خۆی هەڵگرت و لەقوڕگی ئەیاسی چەقاند و ئەوی خستە سەرزەوی و فەرمانی بەیەکێك لەپیاوەکانی خۆیدا کە سەری لەجەستەی جیا کردەوە. هاوەڵانی ئەیاس بڵاوەیان لێکرد و بۆ لای کوڕی موتیع گەڕانەوە.

کوڕی موتیع لەجێگەی ئەو کوڕە گەورەکەی راشد کوڕی ئەیاسی کردە سەرکردە پاسەوانەکانی خۆی و رەوانەی کرد. لەجیاتی راشد، سوەید کوڕی عەبدولرەحمانی مینقەری و ئەبو قەعقاع کوڕی سوەیدی رەوانە کرد.

ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر ڕۆشتە لای موختار وپێی وت: ئێمە بڕیارماندابو سبەی شەو بزوتنەوەکەمان دەست پێبکەین بەڵام پێشهاتێك رویداوە کە ناچارمان دەکات ئەمشەو بزوتنەوەکە دەست پێبکەین. ئیبراهیم موختاری لەروداوەکان ئاگادار کردەوە. موختار لەکوژرانی ئەیاس کوڕی مەزارب شادمان بو و وتی: ئەمە خۆی یەکەم سەرکەوتنە. دواتر بەسەعید کوڕی مینقەزی وت: هەستە و لەسەر ڕمەکان و قامیشەکان ئاگر دابگیرسێنە و هەڵیانکە. تۆیش ئەی عەبدالله کوڕی شەداد، هاوار بکە: ئەی سەرکەوتو، بمرێنە (هاوشێوەی دروشمی تۆڵەستێنەکان و شەڕکەران)، تۆی ئەی سوفیان کوڕی لەیلا و تۆئەی قودامە کوڕی مالك، هەستن و هاوار بکەن: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی حسین دەکەن!

ئیبراهیم پێی وت: ئەوانەی لەگەڕەکەکاندان، رێگە نادەن هاوڕێکانمان بەرەو لای ئێمە بێن. ئەگەر بڕۆمە لای خەڵکەکەی خۆم و وەڵامدەرەوەکان و شوێنکەوتەکان بانگ بکەم و ئەوان بەگەڕەکەکانی کوفەدا بسوڕێنمەوە و دروشمەکان بەرز بکەینەوە، ئەوانەی

خوازیاری هاتنەدەرەوەمن، دێنەدەر. هەرکەسێك هات، لای هاورێکانت جێگیری بکە. ئەگەر ناچار بەپەلە کردن بویت، ئەو کەسانەی لای تۆن، پارێزگاریت لێ دەکەن تا من دەگەرێمەوە. موختار پێی وت: ئەو کارە بکە و خێراکە. ئاگادار بە، نەرۆیتە لای فەرماندارەکەی ئەوان و شەری لەگەڵ نەکەیت، تا ئەو شوێنەی دەتوانی خۆت لەشەر کردن بەدور بگرە مەگەر ئەوەی بۆ ئەو کارە ناچار ببێت.

ئیبراهیم و هاورێکانی بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەرانەوە. هەمو یا زۆرینەی ئەو کەسانەی وەڵامی بانگەوازەکەی ئەویان دابویەوە، لای ئەو کۆبونەوە. ئەو لەو شوێنانەی فەرماندە دەست نیشان کراوەکانی کوری موتیع لەوێ بون، خۆی بەدور دەگرت. کاتێك گەیشتە مزگەوتی سەکون، دەستەیەك لەسوارەکانی زەحر کوری قەیسی جوعەفی، بێ سەرپەرەست، روبەروی بونەوە. ئیبراهیم هێرشی کردە سەریان و زەوی لەوان پاك کردەوە. ئەوەندەی لەوان کوشت تا بەرەو گەرەکی کێندە دوری خستنەوە. بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە، تۆ دەزانی ئێمە بۆ بنەماڵەی پێغەمبەرەکەت، تورە بوین، دژی ئەوان شۆرشمان کرد و خوازیاری خوێنی بەستەم کوژراوەکانین، خوایە، بەسەر ئەواندا زاڵمان بکە.

ئیبراهیم کوری ئەشتەر ئەوانی شکستدا و گەرایەوە و روی لەگەرەکی ئوسیر کرد. دروشمەکەی خۆیان دەوتەوە و لەوێ چاوەروان بون. سوەید کوری عەبدولرەحمانی مینقەری هێرشی کردە سەریان و هەوڵیدا لەناویان ببات و لەم رێگەوە لای کوری موتیع پێگەیەك بەدەست بێنێت. ئیبراهیم هاوەڵانی خۆی بانگ کرد: ئای پاسەوانە خواییەکان، دابەزن کە ئێوە بۆ سەرکەوتن شیاوترن لەم خراپەکارانە کە مەلەیان لەخوێنی بنەماڵەی پێغەمبەرەکەتان کرد. ئەوان هاتن. ئیبراهیم هێرشی کردە سەریان و بۆ بیابان دوری خستنەوە. ئیبراهیم شوێنیان کەوت تا ئەوەی بۆ کوناسە هەڵاتن. هاورێیانی ئیبراهیم پێیان وت: شوێنیان بکەوە و ئەو ترسەی بەسەر ئەواندا زاڵبوە، بۆ لەناوبردنیان بقۆزەرەوە. ئیبراهیم وتی: ئەو کارە ناکەم. دەرۆینە لای رێبەرەکەمان کە پیاوێکی خواپەرەستە تا خوا ترسی ئەو بەبینیی ئێمە برەوێنێتەوە و بزانێت کەچ سەرکەوتنێکمان بەدەست هێناوە. و لەم رێگاوە خۆی و هاورێکانی بەهێزتر ببن هەرچەندە هێشتا ئاسودە نیم کە لەشوێنێکەوە زیانی بەرنەکەوتبێت.

دواتر ئیبراهیم بەرێکەوت تاگەیشتە ماڵەکەی موختار. دەنگەدەنگی بیست و خەڵکانی بینی کەیەکتر کوشتار دەکەن. شەبس کوڕی ریبعی لەسەبخەوە هێرشی کردبوە سەر. موختار یەزید کوڕی ئەنسی بۆ شەڕی ئەو ئامادە کرد. دواتر حەجار کوڕی ئەبجەر هات و موختار ئەحمەر کوڕی شەمیتی بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە کرد. لەو کاتەی خەڵك سەرقاڵی کوشتاری یەکتر بون، لەناکاو ئیبراهیم لەرێگەی کۆشکەوە هات. حەجار و هاورێکانیان ئاگادار کردەوە کە ئیبراهیم لەپشتەوە هێرشی کردۆتە سەریان، پێش ئەوەی ئەوان بێن، ئەمان بۆ ناو کۆڵانەکان رایان کرد و ئیبراهیم و هاورێکانی ئەوانیان نەبینی. قەیس کوڕی تەهفەی نەهدی هاورێ لەگەڵ سەد شەڕکەر گەیشت. ئەو لەیارانی موختار بو. هێرشی کردە سەر شەبس کوڕی رێبعی کە لەگەڵ یەزید کوڕی ئەنس شەڕی دەکرد. رێگەی بۆ ئەوان کردەوە تا کۆبونەوە. شەبس رۆشتە لای کوڕی موتیع و پێی وت؛ فەرماندەکانی ئامادە بۆ شەڕ لەکۆڵانەکان بانگ بکە و خەڵکانیتریش بۆ ئێرە رەوانە بکە و شەڕیان لەگەڵ دەست پێبکە چونکە بەهێز بون و موختار هاتۆتەدەر و خۆی ئاشکرا کردوە و کاروبارەکان بۆ ئەو سامانداراون.

کاتێك وتەکەی بەگوێی موختارگەیشت، لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی هاتەدەر تا لەپشتی دێری هند لەسەبخە دابەزی. ئەبو عوسمانی نەهدی هاتەدەر و لەناو خەڵکانی شاکر هاواری کرد. ئەوان لەماڵەکانیان کۆببونەوە و دەترسان بێنەدەر چونکە کەعبی خەسعەمی لەوان نزیك بو. ئەو دەرگای کۆڵانەکانی بەروی ئەواندا داخستبو. کاتێك ئەبو عوسمان و هاورێکانی رۆشتنە لای ئەوان، هاواریان کرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی حسین دەکەن، ئەوەندە شەڕیان لەگەڵ کەعب کرد کە رێگەی بۆ ئەوان کردەوە. ئەوان بەرەو لای موختار بەرێکەوتن و لای ئەو دابەزین. عەبدالله کوڕی قەتادە لەگەڵ دوسەد شەڕکەر هاتەدەر و پەیوەستی موختار بو.

هەروەها شەبامیەکان هاتنەدەر کەدەستەیەك لەهەمەدان بون. ئەوان لەکۆتاییەکانی شەو گەیشتن. ئەم هەواڵە بەعەبدولرەحمان کوڕی سەعیدی هەمەدانی گەیشت. پەیامی بۆ ناردن کە: ئەگەر دەتانەوێت برۆنە لای موختار، لەگەرەکی سەبیعەوە نەرۆن. ئەوان پەیوەستی موختار بون. لەناو ئەو دوانزە هەزار کەسەی بەیعەتیان لەگەڵ موختار بەستبوە، سێ هەزار و هەشسەد پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆبونەوە. ئەوان پێش

بەرەبەیان گەیشتنە لای ئەو. بەیانی بویەوە و موختار لەم کاتەدا لەرێکخستن و ئامادە کردنی شەڕکەرەکانی تەواو ببو. هێشتا تاریك بو کە نوێژی بەیانی لەگەڵ خەڵك خوێند.

کوڕی موتیع پەیك و پەیامی بۆ گەڕەکەکان رەوانە کرد و فەرمانی پێدان لەمزگەوت کۆببنەوە. فەرمانی بەراشد کوڕی ئەیاسدا هاوار بکات: ئەمان لەسەر هەمو ئەو کەسانە هەڵگیراوە کە ئەمشەو نایێن بۆ مزگەوت. خەڵك کۆبونەوە و کوڕی موتیع، شەبس کوڕی ریبعی لەگەڵ سێ هەزار شەڕکەر بۆ شەڕی موختار رەوانەکرد. دواتر راشد کوڕی ئەیاسی لەگەڵ چوار هەزار کەس لەپاسەوانەکانی رەوانە کرد.

شەبس مەبەستی موختاری کرد. ئەم هەواڵە کاتێك بەموختار گەیشت کە نوێژی بەیانی خوێندبو. لەم کاتەدا سیعر کوڕی ئەبی سیعری حەنەفی لێی نزیك کەوتەوە. ئەو تا ئەو کاتە نەیتوانیبو پەیوەستی موختار ببێت. راشد کوڕی ئەیاسی لەسەر رێگەی خۆی بینی و ئەم هەواڵەی بەموختار راگەیاند. موختار، ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری بەحەوتسەد یا شەشسەد پیاوی شەڕکەر و بەوتەی دەستەیەك بەشەشسەد سوار و شەشسەد پیادە بۆ روبەروبونەوەی راشد رەوانە کرد و نوعەیم کوڕی هوبەیرە، برای مەسقەل کوڕی هوبەیرەی بەسێسەد سوار و شەشسەد پیادە رەوانە کرد و فەرمانی روبەروبونەوەی لەگەڵ شەبس کوڕی ویبعی پێدا. فەرمانی بەم دوانەدا لەکاری جەنگ پەلە بکەن و خۆیان نەکەنە نیشانەی دوژمن کەژمارەیان لەمان زیاترە. ئیبراهیم مەبەستی راشدی کرد. موختار یەزید کوڕی ئەنسی بەنۆسەد پیاوی شەڕکەر لەشوێنی مزگەوتی شەبس کوڕی رێبعی بۆ پێشەوەی خۆی رەوانە کرد. نوعەیم کوڕی هوبەیرە روی لەشەبس کرد و بەقورسی شەڕی لەگەڵ کرد. نوعەیم، سیعر کوڕی ئەبی سیعری کردە فەرماندەی سوارەکان و خۆی هاورێ لەگەڵ پیادەکان بەرێکەوت و شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد تا هەتاو گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان. سوپاکەی شەبس شکەستیان خوارد و بۆ ناو ماڵەکان رایان کرد.. شەبس ئەوانی بانگ کرد و بۆ شەڕی هانیدان. دەستەیەك لەوان گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی نوعەیم کە بڵاو ببونەوە. ئەوانی تێکشکاند. نوعەیم کوڕی هوبەیرە خۆڕاگری کرد و کوژرا. سیعر کوڕی ئەبی سیعر و دەستەیەك لەهاورێکانی گرفتار بون. شەبس دەستبەرداری عەرەبەکان بو و کۆیلەکانی سەربڕی.

شەبس هات و گەمارۆی خستە سەر موختار. لەم کاتەدا بەدوای کوژرانی نوعمیم کوڕی هوبەیرە، موختار تا ئەندازەیەك سست و ناتەوان ببو.

کوڕی موتیع، یەزید کوڕی حارس کوڕی رویەمی هاوڕێ لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر رەوانە کرد کە لەسەر دەروازەی کۆڵانەکان خۆڕاگریان کرد. موختار، یەزید کوڕی ئەنسی کردە فەرماندەی سوارەکان و خۆی لەگەڵ پیادەکان بەرێکەوت. سوارەکانی سوپاکەی شەبس هێرشیان کردە سەریان بەڵام ئەوان لەشوێنی خۆیان نەجولان. یەزید کوڕی ئەنس بەوانی وت: ئەی شیعەکان، ئێوە بەشێوەیەك گرفتار بون کە دەست و پێی ئێوەیان دەبڕیەوە و ئێوەیان لەسەر دارخورماکان لەدار دەدا و ئەمە تەنیا لەبەر خۆشویستنی بنەماڵەی پێغەمبەر بو. ئێستا دەزانن ئەگەر ئەم خراپەکارانە بەسەرتانا زاڵ ببن، چ بەڵایەکتان بەسەردێنن؟ سوێند بەخوا یەك کەس لەئێوە بەزیندویی ناهێڵنەوە، بەئەشکەنجە دەتانکوژن. بەڵایەك بەسەر ژن و منداڵ و سامانەکەتان دەهێنن کە مەرگ زۆر شیرینترە. سوێند بەخوا جگە لەراستی و خۆڕاگری و شمشێر وەشاندنی بەردەوام، هیچ شتێك ئێوە لەدەست ئەوان رزگار ناکات. بۆ هێرش بردن خۆتان ئامادە بکەن. ئەوان ئامادە بون و چاوەڕوانی فەرمانی ئەویان دەکرد. هەمویان کەوتنە سەر ئەژنۆ و دوژمنیان کردە نیشانە.

بەڵام ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر، ئەو روبەڕوی راشد کوڕی ئەیاس بویەوە و بینی کە چوار هەزار شەڕکەری لەگەڵدایە. ئیبراهیم بەیارانی خۆی وت: ئاگاداربن ژمارەی ئەوان نەتانترسێنێت. سوێند بەخوا پیاوێکی ئازا لەدە پیاوی شەڕکەر باشترە و خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە. حوزەیمە کوڕی ئەسر هاوڕێ لەگەڵ سوارەکانی خۆی پەیوەستیان بو. ئەو خۆی پیادە بو و لەناو پیادەکان شەڕی کرد. ئیبراهیم بەئاڵادارەکەی خۆی دەوت: ئاڵاکەی خۆت بۆ پێشەوە ببە، ئەمانیش لەگەڵ ئاڵاکە بۆ پێشەوە ببە.

خەڵك بەسەختی شەڕیان کرد. خوزەیمە کوڕی ئەسری عەبسی هێرشی کردە سەر راشد کوڕی ئەیاس و ئەوی کوشت و جیهانی لەو پاك کردەوە. دواتر هاواری کرد: سوێند بەخوای کەعبە راشدم کوشت. سوپاکەی راشد شکستیان خوارد و هەڵاتن. ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر وخوزەیمە کوڕی ئەسر دوای کوژرانی راشد کوڕی ئەیاس هاتنە لای موختار. ئەو مژدەدەرێکی بۆ لای موختار رەوانە کرد و هەواڵی کوژرانی راشدی پێدا. ئەو و

هاورێکانی تەکبیریان وت و ورەیان بەرز بویەوە و دڵشکان و نەمانی ورە لای سوپاکەی کوڕی موتیع زیادی کرد.

کوڕی موتیع، حەسان کوڕی فاید کوڕی بەکری عەبسی لەگەڵ سوپایەکی گەورە (نزیکەی دو هەزار پیاوی شەڕکەر) رەوانە کرد. ئەو رێگەی لەئیبراهیم گرت تا زیانی ئەو لەسوپاکەی کوڕی موتیع کە لەسەبخە بون، دور بخاتەوە. ئیبراهیم هێرشی کردە سەریان کە بێ جەنگ و رەنج تێکشکان. حەسان کوڕی فاید نەیتوانی پارێزگاری لەسوپاکەی خۆی بکات. خوزەیمە کوڕی نەسر هێرشی کردەسەر بەڵام ئەوی ناسیەوە. پێی وت: ئەی حەسان، ئەگەر خزم نەدەبویت، دەمکوشتی، خۆت رزگار بکە. ئەسپەکەی لەپێکەوت و کەوتە خوار و خەڵك هێرشیان کردەسەر. ماوەیەك شەڕی کرد. خوزەیمە پێی وت: تۆ ئەمان دەدرێیت، خۆت مەکوژە. خەڵك دەستیان لێ هەڵگرت. خوزەیمە بەئیبراهیمی وت: کارێکی باشت کرد. ئەسپێکی بۆ هێنا، سواری کرد و وتی: پەیوەستی کەسەکانی خۆت بە.

ئیبراهیم بۆ هاوکاری کردنی موختار رۆیشت کەشەبس کوڕی رێبعی گەمارۆیدابو. یەزید کوڕی حارس روبەروی بویەوە. ئەو لەسەر دەروازەی کۆڵانەکان پاسەوانی دانابو. ئیبراهیم هات تا موختار لەبەرابەر سوپاکەی شەبس بپارێزێت. ئیبراهیم دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بەسەرکردایەتی خوزەیمە کوڕی نەسر رەوانە کرد و خۆی بۆ لای موختار غاریدا کە لەگەڵ شەبس کوڕی رێبعی و سوپاکەی ئەو شەڕی دەکرد. کاتێك ئیبراهیم نزیك کەوتەوە، هێرشی کردە سەر شەبس. یەزید کوڕی ئەنەسیش هێرشی کرد. شەبس و سوپاکەی بۆ ناو ماڵەکانی کوفە خزان. خوزەیمە کوڕی نەسر هێرشی کردە سەر یەزید کوڕی حارس و هێزەکانی ئەوی تێکشکاند. ئەوان لەسەر دەروازەی کۆڵانەکان زۆربون و کۆبونەوە ودەستەیەك رۆشتنە سەر بانەکان. موختار هات. کاتێك گەیشتە دەروازەی کۆڵانەکان، تیرهاوێژەکان تیربارانیان کرد و رێگەیان نەدا لەوێوە بڕواتە ناو کوفە.

خەڵك تێکشاو، لەشوێنی سەبخەوە بۆ لای کوڕی موتیع گەڕانەوە. لەم ناوەدا هەواڵی کوژرانی راشد کوڕی ئەیاسی پێگەیشت و ئەو زیاتر تێکشکا و خەمبار بو. عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی پێی وت: ئەی پیاو، خەمبار مەبە، برۆ لای خەڵك وبۆ شەڕ لەگەڵ دژومن هانیان بدە چونکە خەڵك فراوانن و هەموان لەگەڵ تۆن جگە لەو دەستە کەمەی

کەمێستا دژی تۆ راپەڕیون و خوا ریسواکەری ئەوانە. من یەکەم خۆبەخشم. لەگەڵ من و کەسانی وەك دەستەیەك رەوانە بکە.

کوڕی موتیع هاتەدەر و لەناو خەڵکدا وەستا و سەرکۆنەی ئەوانی کرد کە شکەستیان خواردوە. داوای لێکردن بۆ شەڕی موختار و هاوڕێکانی بەرێکەون.

کاتێك موختار بینی یەزید کوڕی حارس رێگە نادات بڕواتە ناو کوفە، بەرەو ماڵەکانی ئەحمەس و بارق و موزینە غاریدا. ماڵەکانی ئەوان یەك یەك و دور لەیەك بو. ئاویان بەسوپاکەیدا بەڵام موختار نەیخوارد چونکە بەرۆژو بو. ئەحمەر کوڕی شەمیت بە کوڕی کاملی وت: ئایا گومان دەکەیت ئەو بەرۆژوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەگەر رۆژوەکەی دەشکاند، هێزی وەردەگرت و باشتر دەبو. وتی: ئەو پارێزراوە (مەعصوم) و باشتر دەزانێت چی بکات. ئەحمەر وتی: راست دەکەیت، هیوادرام خوا بمبەخشێت.

موختار وتی: باشترین شوێن بۆ شەڕ کردن ئێرەیە! ئیبراهیم وتی: خوا ئەم خەڵکەی تێکشاندوە و ترس کەوتۆتە دڵیان. لەگەڵ ئێمە بەرێکەوە و بەخواستی خوا تا دابەزین لەکۆشك هیچ بەربەستێکمان نابێت. موختار هەمو بەتەمەن و نەخۆش و پەککەوتەکانی لەوێ بەجێهێشت و ئەبو عوسمانی ئەهدی بۆ پارێزگاری کردن لەوان راسپارد. ئیبراهیم لەپێش موختارەوە بەرێکەوت. کوڕی موتیع، عەمرۆ کوڕی حەجاجی لەگەڵ دو هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ روبەروبونەوەی ئەوان رەوانە کرد. موختار پەیامی بۆ ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر رەوانە کرد کە: بۆ پێشەوە بڕۆ و مەوەستە. ئیبراهیم بۆ پێشەوە رۆیشت و مایەوە. موختار فەرمانی بەیەزید کوڕی ئەنسدا کە روبەروی عەمرۆ کوڕی حەجاج ببێتەوە. ئەو بەرێکەوت. موختار بەدوای ئیبراهیم بەرێکەوت. دواتر لەنوێژگەی خالید کوڕی عەبداللە چاوەڕوانی کرد و ئیبراهیم بەرێکەوت تا لەکوناسەوە بڕواتە ناو کوفە. شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن لەگەڵ دو هەزار پیاوی شەڕکەر روبەروی بویەوە. موختار، سەعید کوڕی مونقیزی هەمەدانی بۆ روبەروبونەوەی شیمر رەوانە کرد کە شەڕی دەست پێکرد. کەسی بۆ لای ئیبراهیم رەوانە کرد و فەرمانی پێدا بەرێکەوێت. ئەو بەرێکەوت تا گەیشتە کۆڵانی شەبس، بینی کە نەوفل کوڕی موساحیق هاورێ لەگەڵ دو هەزار یا پێنج هەزار پیاوی شەڕکەر ئامادە بۆ شەڕ وەستاوە. کوڕی موتیع فەرمانیدا لەناو خەڵکدا هاوار بکەن: پەیوەستی کوڕی موساحیق ببن.

کوڕی موتیع هات و لەکوناسە چاوەڕێ بو و شەبس کوڕی ڕێبعی وەك جێگری خۆی لەکۆشك دەستنیشان کرد. ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر لە کوڕی موتیع نزیك کەوتەوە و بەهاوڕێیانی خۆی وت پیادە ببن. بەوانی وت: ترس نەکەوێتە دڵتانەوە کەدەڵێن: شەبس هات، بنەماڵەی عوتەیبە کوڕی نەهاس هات، بنەماڵەی ئەشعەس هات، بنەماڵەی یەزید کوڕی حارس هات وبنەماڵەی فلان هات (ناوی بنەماڵەکانی کوفەی برد). دواتر وتی: ئەگەر ئەمان گەرمای شمشێر ببینن، شکەست دەخۆن و هەڵدێن و کوڕی موتیع بەجێدێڵن، بەشێوەیەك ڕەم دەکەم کە بزن لەبەرابەر گورگ. ئەو کارەیان کرد.

ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر، داوێنی عاباکەی خۆی تا کەمەر بەرز کردەوە. عابایان بەسەر زرێ وە لەبەر دەکرد. کاتێك هێرشی کردە سەر ئەوان، زۆری نەخایاند کە شکەستیان خوارد و بەسەر یەکدا هەڵدەگەڕان و ڕویان لەدەروازەکانی کوفە کرد و لەوێ کۆبونەوە. ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر خۆی بەنەوفل کوڕی موساحیق گەیاند. جڵەوی ئەسپەکەی گرت و شمشێری دەرکێشا تا بیکوژێت. کوڕی موساحیق وتی: ئەی کوڕی ئەشتەر، سوێندت دەدەم بەخوا، ئایا دوژمنایەتی لەنێوان من و تۆدا هەیە، یا خوێنێك کە لەمنی داوا بکەیت؟ ئیبراهیم ئازادی کرد. پیاو وتی: بەردەوام ئەم کارەی تۆم لەبیر دەبێت. ئەو بەردەوام ئەو کارەی ئیبراهیمی بیردەهێنایەوە.

ئەمان بەدوای ئەوان بۆ کوناسە ڕۆیشتن و ڕۆشتنە ناو بازار ومزگەوت و گەمارۆیان خستە سەر کوڕی موتیع و سەرکردەکانی خەڵك، جگە لەعەمرۆ کوڕی حورەیس لەگەڵ ئەودا بون. عەمرۆ کوڕی حورەیس ڕۆشتە ماڵەکەی و دواتر ڕێگەی بیابانی گرتەبەر. موختار هات و لای بازار چاوەڕوانی کرد. ئیبراهیم گەمارۆی خستە سەر کۆشك و یەزید کوڕی ئەنس و ئەحمەر کوڕی شەمیت لەگەڵ ئەودا بون. بۆ ماوەی سێ ڕۆژ گەمارۆیان لەسەر دانان. ئەو ئاڵقەی گەمارۆکەی بەردەوام تەنگتر و تەنگتر دەکرد. شەبس بە کوڕی موتیعی وت: جوان لەکاروباری خۆت و هاوڕێکانت بڕوانە چونکە سوێند بەخوا ئەوان لەخۆیان و لەتۆ بێ نیاز نین. وتی: بۆچونی ڕاستم نیشان بدەن. شەبس وتی: بۆچونی ڕاست ئەوەیە بۆ خۆت و ئێمە ئەمان وەربگریت و بڕۆیت و خۆت و بنەماڵەکەت لەناو نەبەیت. کوڕی موتیع وتی: من ئەم کارە بەپەسەند نازانم چونکە کاروبارەکان لەحیجاز و بەسرە بۆ سەرورەری باوەڕداران ئارام و سەقامگیر بون. وتی: کەواتە بڕۆ بێ ئەوەی

کەس بەم نهێنیە بزانێت. لەکوفە لای هەر کەسێك کە دەتەوێت، بمێنەرەوە و دواتر پەیوەستی سەروەری باوەڕداران بە.

هەروەها عەبدولرەحمان کوڕی سەعید و ئەسعد کوڕی خارجە وکوڕی میخنەف و سەرکردەکانی کوفە ئەم بۆچونەیان پشت راست کردەوە. ئەو مایەوە تا شەو داهات.

بەوانی وت: زانیم ئەوانەی ئەم کارەیان لەگەڵ ئێوە کرد، ریسواکان و پەستەکان بون چونکە گەورەکان و سەروەرانی ئێوە گوێرایەڵ و فەرمانبەرن. من هەواڵی کارەکانی ئێوە بەسەروەری باوەڕداران رادەگەیێنم و گوێرایەڵی و شەری ئێوەی بیردەخەمەوە تا خوا فەرمانەکانی خۆی جێبەجێ بکات. ئەوان وەصفیان کرد.

ئەو لای ئەوان ڕۆشتە ماڵی ئەبوموسا. ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر هات و لەبەردەگای کۆشك وەستا. دەرگاوانەکان دەرگای کۆشکیان کردەوە و وتیان: ئەی کوڕی ئەشتەر، ئایا ئەمانمان هەیە؟ وتی: ئەمانتان پێ بەخشرا. هاتنەدەر و لەگەڵ موختار بەیعەتیان کرد. موختار ڕۆشتە ناو کۆشك و لەوێ مایەوە و شەوی کردە بەیانی. گەورەکان لەمزگەوت و دەوروبەری کۆشك بون. موختار هاتەدەر و ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی:

سوپاس بۆ خوایەك کەمژدەی سەرکەوتنی بەهاورێکەی خۆیدا و زیانی بەدوژمنەکانی بەخشی. ئەو ئەمەی لەکۆتایی رۆژگار، کردە مژدەیەك و فەرمانێك و کارێکی بێ چەند و چون. هەرکەس درۆی هەڵبەست، هێوابڕاو بو. ئەی خەڵکینە، ئالآیەکیان بۆ هەڵکردین و نیشانەیەك لەبەردەممان. سەبارەت بەئالآکە وتویانە بەردەوام با شەکاوە بێت و سەبارەت بەنیشانەکە وتویانە بەرەو لای برۆن و هیچ کات پشت گوێی مەخەن. ئێمە گوێمان لەبانگەوازەکە گرت و بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی ڕێبەرەکەمان هەوڵماندا. زۆرن ئەو ژن و پیاوانەی هەواڵی مەرگ دەدەن و شین و گریان دەست پێدەکەن. دور بێت ئەو کەسەی پاخیگەری دەکاتە پیشە یا لەشەڕ بترسێت یا گوناح بکات یا درۆ بۆ پێشەوا هەڵبەستێت یا لەگۆڕەپانی شەڕ رابکات. ئەی خەڵکینە کۆببنەوە و لەسەر بنەمای رزگار بون بەیعەت بکەن چونکە سوێند بەو کەسەی لەسەر زەوی ئاسمانی جێگیر کرد و خاکی بەدۆڵەکان کردە رێ رێ، دوای بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب دەستی بەیعەتتان بۆ کەسێکی شیاوتر لەمن درێژ نەکردوە.

دواتر هاتە خوار و ڕۆشتە ناو کۆشك و گەورەکانی کوفە ڕۆشتنە لای و لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر و داوا کردنی خوێنی بنەماڵەی پێغەمبەر و شەڕ لەگەڵ دوژمنانی دین و بەرگری کردن لەهەژاران و خۆشەویستی لەگەڵ ئاشتی خوازەکان، بەیعەتیان لەگەڵ کرد.

لەناو ئەو کەسانەی بەیعەتیان لەگەڵ کرد، یەکیان مونزەر کوڕی حەسان بو و یەکێتر حەسان کوڕی مونزەر. کاتێك ئەم دوانە لای موختار گەڕانەوە، سەعید کوڕی مێنقەزی سوری لەگەڵ دەستەیەك لەشیعەکان ڕۆشتنە سەردانی. کاتێك ئەم دوانەیان بینی، وتیان: سوێند بەخوا ئەمانە لەسەرکردەی یاخیەکانن. مونزەر و حەسانی کوڕیان کوشت. سەعید ڕێگەی ئەم کارەی لێگرتن تا فەرمان لەموختار وەربگرن. بەلأم ئەوان ڕازی نەبون. کاتێك موختار ئەو هەواڵەی بیست، پەسەندی نەکرد. موختار روی لەخەڵك کرد و مژدەی پێدان و خۆشەویستی گەورەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و هەوڵیدا هەڵس و کەوتێکی گونجاو و شیاو بگرێتەبەر.

پێیان وت: کوڕی موتیع لەماڵی ئەبو موسایە. ئەو بێدەنگ بو. کاتێك شەو داهات، سەد هەزار دەرەمی بۆ ڕەوانە کرد و وتی: کاروبارەکانی خۆت سامان بدە و خۆت بەم زێرانە بەهێز بکە چونکە من شوێنەکەی تۆ دەزانم و دەزانم تەنیا لەبەر نەبونی پارە نەڕۆشتویت. ئەم دوانە لەکۆنەوە هاوڕێی یەك بون.

موختار لەگەنجینە نۆ هەزار هەزار (نۆملیۆن) دەرەمی دەستکەوت. بەهاوڕێکانی خۆی کە لەبەرژەوەندی ئەو شەڕیان کردبو و نزیکەی سێ هەزار وپێنسەد پیاوی شەڕکەربون، پێنسەد دەرەمی بەخشی. و بەکەسانیتر کەژمارەیان شەش هەزار کەس و دوای ئەوە هاتنە لای و کۆشکەکەیان گەمارۆدابو و لە ماوەی ئەو سێ شەو ڕۆژەدا هاوڕێیەتیان دەکرد، دوسەد دەرەمی بەخشی. بەچاکە هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵك کرد. گەورەکانی کردە هاونشینی خۆی و عەبدالله کوڕی کاملی یەشاکری کردە فەرماندە پاسەوانەکانی خۆی و فەرماندەیی پارێزەرانی بە کیسان کوڕی ئەبوعەمرە سپارد.

ڕۆژێك ئەم ئەبو عەمرەیە لەسەر سەری وەستا بو و موختار تەنیا روی لەگەورەکان دەکرد و قسەی لەگەڵ ئەوان دەکرد. یەکێك لەخزمەکانی ئەبو عەمرە (لەموالیەکان) پێی وت: ئەی باوکی ئیسحاق، نابینیت تەنیا لەگەڵ عەرەبەکان قسە دەکات وئاوڕ لەئێمە

ناداتەوە؟ موختار پرسیاری کرد کە باسی چیتان دەکرد. ئاگاداریان کردەوە. موختار پێی وت: پێیان بڵێ ئەم کارەیان بەلاوە ناخۆش نەبێت چونکە ئێوە لەمن و من لەئێوەم. دواتر بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بون، وتی: ئێمە لەگوناحاکاران، تۆڵەمان سەندەوە (سجدە/ ٢٢/٣٢) کاتێك ئەم قسەیان لێ بیست، وتیان: مژدەتان لێ بێت، وەك بڵێی کوشتارتان کرد یانی گەورەکان.

یەکەم ئالا کەموختار بەستی، بۆ عەبدالله کوڕی حارس برای مالکی ئەشتەر بو کە ئەوی بۆ ئەرمەنستان رەوانە کرد. دواتر ئالای بۆ ئەم کەسانە بەست و رەوانەی کردن: محەممەد کوڕی عومەیر کوڕی عوتارد بۆ ئازەربایەجان، عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کوڕی قەیس بۆ موسڵ، ئیسحاق کوڕی مەسعود بۆ مەداین و سەرزەمینی جوخی، قودامە ئەبی عیسا کوڕی زەمعەی ئەسری هاوپەیمانی سەقەفیەکان بۆ بێهقوبادی سەرو، محەممەد کوڕی کەعب کوڕی قورەزە بۆ بێهقوبادی ناوەڕاست، سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان بۆ حیلوان کە فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ کوردەکان بکات و ڕێگاکان ئەمن بکات.

کوڕی زوبەیر، محەممەد کوڕی ئەشعەس کوڕی قەیسی وەك فەرمانداری موسڵ دەستنیشان کردبو. کاتێك موختار هاتە سەرکارو عەبدولرەحمانی وەك فەرمانداری موسڵ دەستنیشان کرد، محەممەد لەوێوە بۆ تکریت کۆچی کرد و چاوەڕوانی کۆتایی کارەکانی دەکرد. دواتر ڕۆشتە لای موختار و بەیعەتی لەگەڵ کرد.

کاتێك موختار لەم کارە سەرەتاییانە تەواو بو، بەکاری داوەری کردن هەستا وبۆ داوەری کردن لەنێوان خەڵك دانیشت. دواتر وتی: بەم هەمو گرفتاریەوە لەکاری داوەری کردن بێ ئاگا نابم. دواتر شورەیحی کردە سەرپەرەستی دامەزراوەی داد. شورەیح لەخەڵك ترسا و نەخۆشی کردە بیانو. خەڵکان دەیانوت: ئەم کەمتیارە پیرە خڵەفاوە، شیاو نیە بۆ ئەم کارە گەورە. ئەو شوێنکەوتەی عوسمان بو. ئەو بو لەزیانی حوجر کوڕی عودەی شایەتی دا، ئەو لەداستانی کوژرانی موسلیم کوڕی عەقیل لەگەیاندنی پەیامی هانی کوڕی عوروە بەخەڵکەکەی خۆی دورەپەرێز گرت، ئەو بو عەلی کوڕی ئەبی تالبی لەکارەکەی دورخستەوە. کاتێك ئەم وتانە بەگوێی شورەیح گەیشت، نەخۆشی کردە بیانو. موختار لەجیاتی ئەو عەبدالله کوڕی عوتەبە کوڕی مەسعودی بۆ ئەم کارە دەستنیشان کرد. عەبدالله نەخۆش کەوت و موختار لەجێگەی ئەو عەبدالله کوڕی مالکی تەمیمی دانا.

## کوژرانی بکوژەکانی حسین کوڕی عەلی

## لەسەردەستی موختار کوڕی ئەبی عوبەیدە

لەم ساڵەدا موختار بەتۆڵە سەندنەوە لەبکوژەکانی حسین کوڕی عەلی (ئەوانەی لەکوفە بون)هەستا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك کاروباری شام بۆ مەروان کوڕی حەکەم سامانذرا، دوسوپای رەوانە کرد، یەکیان بۆ حیجاز بەسەرکردایەتی حوبەیش کوڕی دەلجەی قینی (کە ئاماژەمان بەداستانی کوژرانی ئەودا) و یەکیتریان بۆ عێراق بەسەرکردایەتی کوڕی زیاد کە بەسەرهاتەکەیمان گێڕایەوە و ئاماژەمان پێدا کەدەستەیەك لەخەڵکانی کوفە لەکارەکەی خۆیان پەشیمان بونەوە و تۆبەیان کرد و لەگەڵ کوڕی زیاد شەڕیان دەست پێکرد و دەستەیەکی فراوان لەبکوژەکانی حسین کوڕی عەلیان کوشت. مەروان پەیمانی لەگەڵ کوڕی زیاد بەستبو، دەست بەسەر هەر ناوچە و سەرزەمینێك بگرێت، بۆ خۆی بێت: فەرمانیدا بۆ ماوەی سێ رۆژ هێرش و تاڵانی لەکوفە بخەنەگەڕ. قاچی کوڕی زیاد لەجەزیرە لەقوڕ چەقی. خەڵکی قەیسی عەیلان هاوڕێ لەگەڵ زەفەر کوڕی حارس لەوێ بون و ملکەچی فەرمانەکانی کوڕی زوبەیر بون. عوبەیدالله کوڕی زیاد بۆ ماوەی یەك ساڵ سەرقاڵی شەرکردن لەگەڵ ئەوان بو.

مەروان مرد و کوڕەکەی عەبدولمەلیك هاتەسەر کار. کوڕی زیادی لەپەیمانەکەی باوکی دڵنیا کردەوە و فەرمانی پێدا لەکارە پێراسپێردراوەکانی هەوڵی زیاتر بدات.

کاتێك رۆژگار تێپەڕی و کوڕی زیاد نەیتوانی چارەسەری قەیسیەکان بکات، روی کردە موسڵ و عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کارگوزاری موختار لەوێ بو. ئەو نامەی بۆ موختار نوسی و ئاگاداری کردەوە کە کوڕی زیاد هاتۆتە موسڵ و ئەو لەبەرژەوەندی کوڕی زیاد موسڵی بەجێهێشتوە و ڕۆشتۆتە تکریت. موختار، یەزید کوڕی ئەنسی بانگ کرد و فەرمانی پێدا بەرەو موسڵ بڕوات و لەخوارەوەی ئەو سەرزەمینە دابەزێت تا ئەو سوپای پشتیوانی بۆ رەوانە بکات. یەزید وتی: رێگە بدە سێ هەزار سوار هەڵبژێرم، هەروەها لەکارەکەمدا سەربەستم بکە، ئەگەر پێویستم بو نامە بۆ تۆ دەنوسم و داوای هاوکاریت لێ دەکەم. موختار رێگەی پێدا. ئەو سێ هەزار پیاوی شەڕکەری بۆ خۆی

هەڵبژارد و لەکوفەوە بەڕێکەوت. موختار و خەڵك بۆ بەڕێکردنی هاتنەدەر. کاتێك ویستی ماڵئاوایی لێ بکات، پێی وت: ئەگەر روبەروی دوژمنان بویتەوە، دەرفەتیان پێمەدە و ئەگەر بەسەر ئەوان سەرکەوتیت، کارەکانی خۆت پشت گوێ مەخە. دەبێت رۆژانە هەواڵی تۆ بەمن بگات. ئەگەر پێویستت بەهاوکاری بو، بۆم بنوسە هەرچەند من هێزی پشتیوان بۆ تۆ رەوانە دەکەم ئەگەر بۆیشم نەنوسیت تا ئەم کارە بازوەکانی تۆ بەهێز بکات و دوژمنانی تۆ پەرێشان. لەخوا بۆیان پاڕایەوە تا ئەوان بەتەندروستی بهێڵێتەوە. ئەوانیش لەخوا بۆ موختار پاڕانەوە. بەوانی وت: لەخوا داوای گیان بەخشینم بۆ بکەن کەئەگەر سەرکەوتنم بەدەست نەهێنا، گیان بەخشینم بەدەست هێنا بێت.

موختار بۆ عەبدولرەحمان کوڕی سەعید نامەی نوسی تا ئەو سەرزەمینانە بەیەزید کوڕی ئەنس بسپێرێت. یەزید بەرەو مەداین بەڕێکەوت و لەسەرزەمینی جوخی تێپەڕی کرد و بەرەو (رازانات) ڕۆشت و سەرئەنجام گەیشتە موسڵ و لەباتلی دابەزی. ئەم هەواڵە بەکوڕی زیاد گەیشت کەوتی: سوێند دەخۆم بێ گومان بۆ هەر هەزار کەس دو هەزار کەس رەوانە دەکەم. ئەو رەبیعە کوڕی موخاریقی غەنەوی لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر رەوانە کرد و عەبداللە کوڕی جوملەی خەسعەمی لەگەڵ سێ هەزار شەڕکەریتر. رەبیعە رۆژێك پێش عەبداللە کوڕی جوملە بەڕێکەوت و لەبەرابەر یەزید کوڕی ئەنس لەباتلی دابەزی. ئەو نەخۆش بو و سوار کەرێك دەبو کە هاورێکانی هەوسارەکەیان دەگرت و بەم لاولایان دەبرد. لەبەرابەر سوپاکەی خۆی وەستا و ئەوانی بۆ شەڕ کردن رێکخست و بۆ شەڕ هانیدان و وتی: ئەگەر کوژرام، فەرماندەکەتان وەرقا کوڕی عازەبی ئەسەدی بێت وئەگەر ئەویش کوژرا، فەرماندە عەبداللە کوڕی زەمورەی عوزری و ئەگەر ئەویش کوژرا، سیعر کوڕی ئەبی سیعر فەرماندەیی بگرێتە دەست. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی خۆی بەعەبداللە کوڕی زەمورە و فەرماندەی باڵی چەپی بە سیعر کوڕی ئەبی سیعر و فەرماندەی سوارەکانی بەوەرقا کوڕی عازەب سپارد. خۆی دابەزی. ئەویان لەناو شەڕکەران لەسەر تەختێك دانیشاند. بەردەوام دەیوت: ئەگەر دەتانەوێت، بەرگری لەفەرماندەکەی خۆتان بکەن و ئەگەر ناتانەوێت، رابکەن. فەرمانی بەخەڵکدەدا چی بکەن، دواتر بێ هۆش دەکەوت و دەهاتە هۆش و دوبارە دەکەوتە سەر تەختەکە.

خەڵك لەکاتی بەرەبەیانی زو، لەرۆژی (عەرەفە) نۆی زی ئەلحەجە / ٧ ژوئیەی ٦٨٦ زایینی روبەروی یەك بونەوە و شەڕێکی گەرم و بەشکۆیان دەست پێکرد کە تا نیمەڕۆ درێژەی کێشا. خەڵکانی شام شکەستیان خوارد و سوپاکەیان هەڵات و لەشکرگەکەیان دەستی بەسەرداگیرا. سوپاکەی یەزید کوڕی ئەنس بەرەبیعە کوڕی موخاریق گەیشتن کە سوپاکەی لەدەوری ئەو بلاّوەیان لێکردبو. ئەو لەئەسپەکەی دابەزیبو و هاواری دەکرد: ئەی پشتیوانانانی راستی و دروستی! من موخاریقم، ئێوە شەڕ لەگەڵ کۆیلە هەڵاتوەکان دەکەن و لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان لەدینی ئیسلام دەجەنگن. کەسانێك لەدەوری کۆبونەوە و ئازایانە شەریان کرد. دواتر شەڕ روی لەدژواری کرد و خەڵکانی شام شکەستیان خوارد و رەبیعە کوڕی موخاریق کوژرا. ئەوبەدەستی عەبدالله کوڕی وەرقای ئەسەدی و عەبدالله کوڕی زەمورەی عەبدی کوژرا. هەڵاتوان رێگەیەکی زۆریان نەبڕی کە عەبدالله کوڕی جوملە بەسێ هەزار شەڕکەر روبەرویان بویەوە. ئەو بۆ هاوکاری ئەوان هاتبو.

یەزید کوڕی ئەنس لەباتلی دابەزی. سوپاکەی شەویان کردە رۆژ و پارێزگاریان لەیەك دەکرد. کاتێك بەرەبەیانی دەی زەی ئەلحەجە/ ٨ ژوئیەی ٦٨٦ زایینی، گەیشت، رویان لەگۆرەپانی شەڕکرد و ئازایانە شەڕیان تاقی کردەوە. دواتر نوێژی نیمەڕۆیان خوێند و بۆ گۆڕەپانی شەڕ گەڕانەوە. شامیەکان هەڵاتن. کوڕی جوملە لەگەڵ دەستەیەك مایەوە و ئازایانە شەڕی کرد. عەبدالله کوڕی قەرادی خەسعەمی هێرشی کردەسەر و کوشتی. خەڵکانی کوفە سوپاکەی ئەویان گەمارۆدا و تا توانیان کوشتاریان کردن و سێسەد کەسیان لەوان بەئەسیری گرت. یەزید کوڕی ئەنس لەدوایین ساتەکانی ژیانی فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد. دواتر لەکۆتایی رۆژ گیانی سپارد. هاورێکانی بەخاکیان سپارد بەلاّم لەکوژرانی ئەو شلەژان و پەرێشان بون.

ئەو، وەرقا کوڕی عازبی ئەسەدی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردبو. وەرقا نوێژی لەسەر خوێند و دواتر بەهاورێیانی خۆی وت: چی دەبینن؟ ئاگاداریان کردومەتەوە کە کوڕی زیاد بەسوپایەکی هەشتا هەزار کەسی مەبەستی ئێمەی کردوە. من پیاوێکم لەئێوە، بۆچونی راستم پێ بڵێن چونکە گومان دەکەم نەتوانین لەبەرابەر شامیەکان خۆڕاگری بکەین بەتایبەت ئێستا کەیەزید کوڕی ئەنس لەناو ئێمەدا نیە و دەستەیەك لەهاورێکانمان بلاّوەیان لێکردوە. ئەگەر ئەمڕۆ خۆمان بگەرێنەوە، دەڵێن:

فەرماندەکەیان مردو گەڕانەوە. بەمشێوەیە بەردەوام لەئێمە دەترسن. ئەگەر ئەمڕۆ شەڕیان لەگەڵ بکەین، زیانمان بەردەکەوێت. ئەگەر ئەمڕۆ شکستمان بدەن، ئەو شکستەی دوێنێکە بەسەر ئەواندا سەپاندمان، هیچ سودێکی نیە. وتیان: بۆچونەکەت راستە. گەڕانەوە.

هەواڵی ئەم کارە بەخەڵکانی کوفە گەیشت. ئەوان سەبارەت بەموختار زۆریان وت و پەرێشان بون. باوەڕیان نەدەکرد کەیەزید کوڕی ئەنس مردبێت. دەیانوت: ئەو نەکوژراوە. موختار ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری نەخەعی بانگ کرد و کردیە فەرماندەی حەوت هەزار پیاوی شەڕکەر. پێی وت: بەرێکەوە، کاتێك سوپاکەی یەزید کوڕی ئەنست بینی، فەرماندەیی ئەوان بگرە دەست. ئەوان لەگەڵ خۆت بگەڕێنەرەوە و رەوانە بە و کاتێك روبەروی کوڕی زیاد بویتەوە، شەڕ دەست پێبکە. ئیبراهیم ڕۆشت و لە(حمام العین) (گەرماوی سەرچاوەکان) خێوەتی هەڵدا. کاتێك بەرێکەوت، گەورەکان وناودارانی کوفە لای شەبس کوڕی رێبعی کۆبونەوە و وتیان: سوێند بەخوا موختار بێ رەزامەندی ئێمە فەرمانڕەوایی ئێمە گرتۆتەدەست و بەزۆرداری فەرمانەکانی دەسەپێنێت. کۆیلەکانی خۆی لەئێمە نزیك کردۆتەوە و ئەوانی سوار ئەسپەکان کردوە و بەشی ئێمەی بەوان بەخشیوە. شەبس پیری ئەوان بو. ئەو پیاوێکی جاهلی – ئیسلامی بو. وتی: رێگە بدەن چاوم پێی بکەوێت.

ئەو ڕۆشتە لای موختار. هەر شتێك ببوە هۆی نارەزامەندی گەورەکان، لەگەڵ موختاردا باسی کرد. سەبارەت بەهەر شتێك قسەی دەکرد، موختار دەیوت: ئەوان لەو کارەدا رەزامەند دەکەم و ئەو کارە دەکەم کە جێگەی رەزامەندی ئەوان بێت. سەبارەت بەکۆیلەکان (یامەوالی) قسەی کرد کە بونەتە شەریکی ئەوان لەتالأنیە جەنگیەکان. موختار وتی: ئەگەر کۆیلەکان پشت گوێ بخەم و بەهرەی ئێوە بەخۆتان بدەم، لەبەرژەوەندی من لەگەڵ بەنی ئومەییە و کوڕی زوبەیر دەجەنگن؟ لەمبارەوە پەیمان و سوێندی خوا بەمن بدەن کە لەسەر بنەمای وتارەکانی خۆتان دەجوڵێنەوە و بەڵێنێك بدەن بەشێوەیەك باوەڕەکان پێی ئارام بگرێت؟ شەبس وتی: دەڕۆمە لای هاورێکانی خۆم و ئەم بابەتەیان لەگەڵ باس دەکەم. ڕۆشتە لای ئەوان و ئیتر بۆ لای موختار نەگەڕایەوە. ئەوان بۆ دژایەتی کردنی ئەو یەکیان گرت.

شەبس کوڕی ڕێبعی و محەممەد کوڕی ئەشعەس و عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کوڕی قەیس و شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن کۆبونەوە و ڕۆشتنە لای کەعب کوڕی ئەبی کەعبی خەسعەمی و لەمبارەوە گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و ئەویش وەڵامی داواکاریەکەی ئەوانی دایەوە و بەپێشنیارەکەیان رازی بو. لای ئەو هاتنەدەر و ڕۆشتنەماڵی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف ئەزدی و پێشنیاری ئەم کارەیان پێدا. وتی: ئەگەر فەرمان لەمن دەبەن، دژایەتی ئەو مەکەن. وتیان: بۆ؟ وتی: دەترسم گیرۆدەی ناسازگاری و چەند بەرەکی ببن چونکە پیاوە ئازا و سوارچاکەکانتان لەگەڵ ئەم پیاوەن. فلآن کەس و فیسارە کەس لەگەڵ ئەون. کۆیلەکان و موالی لەگەڵ ئەون و هەمویان یەك زمان و یەك قسەن. موالیەکانی ئێوە زیاتر لەدوژمنەکانتان لەئێوە بێزارن. ئەو بەهێزی ئازایەتی عەرەبەکان و دوژمنایەتی ئێرانیەکان شەڕ لەگەڵ ئێوە دەکات. ئەگەر چاوەڕوان بن، بەهاتنی خەڵکانی شام، ئەو لەسەر کار لادەبەین، یاخەڵکانی بەسرە هاوکاریتان دەکەن. کاتێك ئەم پێشهاتە روبدات، ئێوە ئەوانتان بەهێزی کەسانیتر لەسەر کار لابردوە و زیان لەنێوان خۆتاندا دروست نابێت. وتیان: سوێندت دەدەین بەخوا ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئێمە نەگریتەبەر و کەلێن لەناو ریزەکانماندا دروست نەکەیت چونکە بۆ کارێکی گەورە کۆبوینەتەوە. وتی: من پیاوێکم لەئێوە. ئەگەر دەخوزان دەست پێ بکەن.

دوای ئەوەی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری نەخەعی بەرێکەوت، ئەوان لەناکاو شۆڕشیان دەست پێکرد و هێرشیان کردە سەر موختار. ئەم کەسانە لەگەڕەکەکان شۆڕشیان دەست پێکرد، لەهەر گەڕەکێك سەرکردەیەك. کاتێك هەواڵی شۆڕشی ئەوانیان بەموختار گەیاند، پەیکێکی خێرایی بۆ لای ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر رەوانە کرد کە لەسابات پێی گەیشت، پەیامی داکە: بگەڕێرەوە و بەپەلە خۆت بەکوفە بگەیێنە. موختار کەسی بۆ لای شۆڕشگێرەکان رەوانە کرد و پرسی: پێم بڵێن چیتان دەوێت؟ هەر شتێکتان بوێت، ئەنجامی دەدەم. وتیان: دەمانەوێت دەست لەفەرمانڕەوایی ئێمە هەڵبگریت چونکە تۆ وای نیشان دەدەیت کەکوڕی حەنیفە تۆی رەوانە کردوە کەنەیکردوە. وتی: دەستەیەك بەنوێنەرایەتی بۆ لای ئەو رەوانە بکەن و منیش دەستەیەك رەوانە دەکەم تا ئەنجامی کارەکان بۆ ئێوە رون و ئاشکرا ببێت. دەیویست بەم وتانە ئارامیان بکاتەوە ورۆژگار بەسەر ببات تائیبراهیم کوڕی ئەشتەر بگات. فەرمانی بەهاورێکانیدا بو شەڕ نەکەن.

خەڵكانی كوفە دەروازەكانی كوفەیان لەسەر داخستبون بەشێوەیەك شتێكی كەم بەوان دەگەیشت. عەبداللە كوڕی سەبیع هاتەدەر و بەنی شاكر بەسەختی شەڕیان لەگەڵ كرد. عوقبە كوڕی تارقی جوشەمی ڕۆشتە لای و لەگەڵ ئەو شەڕی كرد تا پاشەكشێی پێكردن. دواتر عوقبە هێرشی برد و لەگەڵ شیمر كوڕی زی ئەلجەوشن لەگەڕەكی سەلول دابەزی و قەیسی عەیلان هاوڕێیەتیان دەكرد. عەبداللە كوڕی سەبیع لەگەڵ خەڵكانی یەمان لەگەڕەكی سەبیع دابەزی.

كاتێك نێردراوی موختار بۆ لای ئیبراهیم ڕەوانە بو، ئێوارێی ئەو ڕۆژە گەیشتە لای. ئیبراهیم كوڕی ئەشتەر پاشماوەی شەو بۆ پێشەوە ڕۆیشت. كاتێك شەو خێوەتی ڕەشی خۆی بەسەر زەویدا بلاّو كردەوە، دابەزی وسوپاكەی نانی ئێوارێیان خوارد و چوارپێكانیان حەواندەوە. دواتر ئەو شەوە تا بەرەبەیانی و بەیانیەكەی تا نوێژی نیمەڕۆ ئەسپەكانیان غاردا و هێشتا شەو نەهاتبو گەیشتنە شوێنی مەبەست. ئەو شەوی لەمزگەوت بەسەر برد و بەهێزەكانی سوپاكەی هاوڕێیەتی ئەویان دەكرد. كاتێك یەمانیەكان لەگەڕەكی سەبیع كۆبونەوە، كاتی نوێژی ئێوارێ گەیشت بەلاّم هەر سەركردەیەك لەیەمانیەكان بەناخۆشی دەزانی كەسێكیتر پێشكەوێت و لەگەڵ خەڵك نوێژ بخوێنێت. عەبدولرەحمان كوڕی مێخنەف بەوانی وت: ئەمە یەكەم كەلێن و ناسازگاریە! ئەو كەسەی بەسەركردەی خۆتانی دەزانن، بۆ پێشەوە بنێرن: سەروەری قورئان خوێنەكان ریفاعە كوڕی شەدادی بەجلی. ئەم كارەیان كرد و ئەو بەردەوام پێشنوێژی بۆ دەكردن تا شەڕ هەڵگیرسا.

دواتر موختار سوپاكەی خۆی لەناو بازاردا بۆ شەڕ تەیار و ئامادە كرد. فەرمانی بەئیبراهیم كوڕی ئەشتەردا روبەروی موزەریەكان ببێتەوە كە شەبس كوڕی ڕێبعی و محەممەد كوڕی عومەیری عوتاردی فەرماندەیی ورێبەری ئەوانیان لەئەستۆ گرتبو. ئەوان لەكوناسە بون. ترسا ئەو بۆ روبەروبونەوەی یەمانیەكان رەوانە بكات لەبەر ئەوەی ئەكا لەدڵ و گیانەوە شەڕ لەگەڵ خەڵكەكەی خۆی نەكات. موختار خۆی بەرەو گەڕەكی سەبیع بەرێكەوت و لەبەرابەر ماڵی عەمرۆ كوڕی سەعید وەستا. ئەحمەر كوڕی شەمیتی بەجەلی و عەبداللە كوڕی كاملی شاكری لەپێش خۆیەوە رەوانە كرد و فەرمانی پێدان ڕێگایەك بگرنەبەر كە بەگەڕەكەكە كۆتایی دێت. بەنهێنی ئەوانی ئاگادار كردەوە

کەخەڵکی شێبام کەسیان رەوانە کردوە و ئاگاداریان کردۆتەوە کە لەپشتەوە هێرش دەکەنە سەر خراپەکاران. ئەو دوانە، بەهەمان شێوە کەموختاری فەرمانی پێدابون، بەرێکەوتن.

هەواڵ بەیەمانیەکان گەیشت کەئەم دوانە پێشرەویان کردوە. بڵاوبونەوە و دژوارترین و قورسترین شەڕیان بەرێخست کەخەڵکان تا ئەو رۆژە بەچاوی خۆیان نەیاندیبو. سوپاکەی ئەحمەر کوڕی شەمیت و عەبدالله کوڕی کامل شکستیان خوارد و بۆ لای موختار پاشەکشێیان کرد. پرسی: چ هەواڵێکتان پێیە؟ وتیان: شکستمان خوارد، ئەحمەر کوڕی شەمیت لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی دابەزین و نازانین چیان بەسەر هات. هاورێیانی کوڕی کامل وتیان: نازانین چ بەلایەك بەسەر کوڕی کامل هات.

موختار ئەوانی بۆ پێشەوە برد تا گەیشتنە ماڵی ئەبو عەبدالله جەدەلی و لەوێ وەستا. دواتر عەبدالله کوڕی قەرادی خەسعەمی لەگەڵ چوارسەد شەڕکەر بۆ هاوکاری عەبدالله کوڕی کامل رەوانە کرد و پێی وت: ئەگەر ئەو کوژرابو، تۆ فەرماندەیی بگرەدەست و لەگەڵ دوژمن شەڕ بکە. ئەگەر زیندو بو، سێسەد کەس لەشەڕکەران بەو بسپێرە و هاورێ لەگەڵ سەد کەسەکەیتر بەرەو گەرەکی سەبیع بەرێکەوە تا لەشوێنی گەرماوی قەتن هێرش بکەیتە سەر ئەوان.

ئەو بەرێکەوت و بینی کوڕی کامل هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی کە لای ماونەتەوە، شەڕ دەکات. سێسەد پیاوی شەڕکەری بۆ بەجێهێشت و لەگەڵ سەد شەکەر بەرێکەوت تا گەیشتە مزگەوتی عەبد قەیس. بەهاورێکانی خۆی وت: من حەز دەکەم موختار سەرکەوێت بەلام نامەوێت گەورە و سەروەری خەڵکەکەم ئەمرۆ لەناو بچن. سوێند بەخوا بمرم باشترە لەوەی ئەوان لەسەر دەستی من لەناو بچن. ماوەیەك چاوەروانی کرد چونکە بیستبوی کە شێبامیەکان لەپشتەوە هێرش دەکەنە سەر ئەوان. ئەگەری هەیە ئەو کارە بکەن و ئێمە لەکوشتنی ئەوان دوربخەنەوە. بەم وتەی رازی بون و ئەو لای مزگەوتی عەبدقەیس مایەوە.

موختار، مالك کوڕی عەمرۆ ئەهدی کەپیاوێکی ئازا و بەهێز بو، لەگەڵ عەبدالله کوڕی شەریکی ئەهدی بەچوارسەد شەڕکەر بۆ هاوکاری ئەحمەر کوڕی شەمیت رەوانە کرد. گەیشتنە لای ئەو و لەم کاتەدا ئەو خەڵکانە بەسەریدا زاڵبون و ژمارەیان زیاتر لەمان

بو.

بەلأم ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر روبەروی موزەریەکان بویەوە و لەگەڵ شەبس رێبعی و هاورێکانی شەڕی کرد. ئیبراهیم بەوانی وت: هاوار لەئێوە، پەشیمان ببنەوە چونکە نامەوێت موزەریەکان لەسەردەستی من کوشتار بکرێن. ئەوان رازی نەبون و شەڕیان دەست پێکرد و ئیبراهیم ئەوانی تێکشکاند. حەسان کوڕی فایدی عەبسی بریندار بو. ئەویان بردە لای کەسەکانی کە مرد. ئیبراهیم لەگەڵ شەبس دەرگیر بو. مژدەیان بەموختاردا کەموزەریەکان شکستیان خواردوە. ئەو کەسی بۆ لای ئەحمەر کوڕی شەمیت و عەبدالله کوڕی کامل رەوانە کرد و مژدەی سەرکەوتنی پێدان. شەڕ زیاتر خۆش بو. شامیەکان هاتن و ئەبوئەلقلوصیان کردە فەرماندەی خۆیان تا لەپشتەوە هێرش بکەنە سەر یەمانیەکان. بەیەکیان وت: ئەگەر کار و شەڕی خۆتان دژی موزەریەکان و خەڵکی رەبیعە، چڕ بکەنەوە، پەسەندترە. ئەبوئەلقلوص بێدەنگ بو. پێیان وت: چی دەڵێیت؟ وتی: خوای گەورە فەرمویەتی: لەناو ناباوەڕان شەڕ لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن کە لەئێوە نزیکن (توبە/١٢٣/٩) ئەوان هاورێ لەگەڵ ئەو رویان لەشەڕی یەمانیەکان کرد. کاتێك بەرەو گەڕەکی سەبیع رەوانە بون، لەسەر کۆڵانەکە ئەعسەری شاکری روبەرویان بویەوە کە ئەویان کوشت و ڕۆشتنە ناو گەڕەکەکە و هاواریان کرد: نای ئەو کەسانەی داوای خوێنی حسین دەکەن! یەزید کوڕی عومەیر کوڕی زی مورانی هەمەدانی ئەمەی بیست و هاواری کرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی عوسمان دەکەن! ریفاعە کوڕی شەداد بەوانی وت: ئێمە کارمان بەخوێنی عوسمان چیە؟ من لەگەڵ ئەو کەسانەی خوازیاری خوێنی عوسمان بن، شەڕ ناکەم. کەسانێك لەخەڵکەکەی پێیان وت: ئێمەت هێنایە ئێرە و فەرمانەکانی تۆمان ئەنجامدا. ئێستا کەشمشێرەکان بەسەر ئەوان دادەبارن، دەڵێی: بەجێیان بێڵن و بڕۆن! روی کردە ئەوان و وتی:

| | |
|---|---|
| انا ابن شداد على دين على | لست بعثمان بن اروى بولى |
| لاصلين اليوم فيمن يصطلى | بحر نار الحرب غير موتل |

یانی: من کوڕی شەدادم و لەسەر ئایینی عەلی دەژیم، ئەعوسمان کوڕی ئەروی (دایکی عوسمان)م دەوێت ئەوەسفی دەکەم. ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو کەسانەی لەئاگری شەڕدا دەسوتێن، دەسوتێم و کەمتەرخەمی ناکەم.

پیاوانە شەڕی کرد تا کوژرا.

ڕیفاعە هاوڕێی موختار بو. کاتێك ئرۆکانی موختاری بینی، هەوڵیدا بەشێوەیەکی ناناگا لەناوی ببات. دەڵێت: ئەم وتەی پێغەمبەر ڕێگەی نەدا بیکوژم: هەر کەس پیاوێك بکاتە ئەمینی خوێنی خۆی و ئەم کەسە بیکوژێت، من لێی بێزارم.

کاتێك ئەم پێشهاتە رویدا، هاوڕێ لەگەڵ خەڵکانی کوفە شەڕی کرد. کاتێك بیستی یەزید کوڕی عومەیر دەڵێت: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی عوسمان دەکەن! پشتی کردە ئەوان و گەڕایەوە بۆ لای موختار و لەبەرژەوەندی ئەو شەڕی کرد تا کوژرا. ئەم کەسانەیش کوژران: یەزید کوڕی عومەیر کوڕی زی موڕان، نەعمان کوڕی صەهبانی جەرمی کەپیاوێکی خۆپارێز و خوا پەرەست بو، فورات کوڕی زەحر کوڕی قەیس، عەبدالله کوڕی سەعید کوڕی قەیس و عومەر کوڕی مێخنەف. زەحر کوڕی قەیس بریندار بو. عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف شەڕی کردتا بریندار بو و چەند کەسێك لەسەر دەست هەڵیانگرت و ئەو ئاگای لەخۆی نەبو. خەڵکانێك لەئەزد لەدەوری ئەو شەڕیان کرد. یەمانیەکان بەقێزەونترین شێوە شکستیان خوارد. لەماڵی وادعیەکان پێنسەد کەسیان بەئەسیری گرت و دەست بەستراو بردیانە لای موختار. موختار فەرمانیدا و ئەوانیان بەبەردەم ئەو تێپەڕاند. وتی: هەر کەسێك لەکوشتنی حسین کوڕی عەلی بەشدار بوە، بیکوژن. هەمو ئەو کەسانەی لەشەڕی نەینەوا شەڕیان کردبو، کوژران. لەسەر یەك دوسەد و چل و هەشت کەسیان لەوان کوشت. سوپاکەی موختار هەمو ئەو کەسانەیان کوشت کە زیانیان پێگەیاندبون.

کاتێك موختار ئەمەی بینی، فەرمانیدا پاشماوەی ئەسیرەکان ئازاد بکەن. سوێند و پەیمانی لێوەگرتن هیچ کەسێك دژی ئەو هان نەدەن و زیان بەخۆی وهاوڕێکانی نەگەیێنن. جارچی موختار جاڕیدا: هەر کەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات، ئەمانی هەیە جگە لەو کەسانەی دەستیان بەخوێنی بنەماڵەی محەممەد پیس کردوە.

عەمرۆ کوڕی حەجاجی زەبیدی لەو کەسانە بو کە لەرۆژی کوشتنی حسین کوڕی عەلی لەناو سوپاکەی عومەر کوڕی سەعدابو. ئەو سوار وشترەکەی خۆی بو و روی لەدەشتی واقصە کرد وتا ئێستا کەس نەیزانی چی بەسەرهات. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەبیابان لەتینویەتیدا کەوتبو، سوپاکەی موختار گەشتە سەری و سەریان بڕی.

کاتێك فورات کوڕی زەحر کوڕی قەیس کوژرا، عایشە کچی خەلیفە کوڕی عەبداللە جوعفی (کە ژنی حسین کوڕی عەلی بو) کەسی بۆ لای موختار رەوانە کرد و داوای فەرمانی کرد تا لاشەکەی بەخاك بسپێرێت. موختار فەرمانیدا و ئەو ژنە بەخاکی سپارد.

## کوژرانی شیمر کوڕی زی ئەلجەوشن

موختار یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی رەزبی بەدوای شیمر کوڕی زینەلجەوشن رەوانە کرد کە لەناو هاورێکانی خۆی بو. کاتێك لێی نزیك کەوتنەوە، شیمر بەکەسەکانی خۆی وت: لەمن دوربکەونەوە چونکە چاوی تەماح دەبڕنە من. ئەوان لەو دورکەوتنەوە و زەربی لەهاورێکانی خۆی دورکەوتەوە و چاوی لەشیمر بڕی. شیمر هێرشی کردە سەر و خستیە سەرزەوی و کوشتی. ئەو بەرێکەوت و شەوانە لەگوندی (سابیدەما) دابەزی. دواتر بەرێکەوت و لەهەمان شەو لەگوندێك بەناوی کلتانیە باری خست. ئەم گوندە لەقەراغ روبارێك لەسەر تەپۆلکەیەك بو. ئەو پەیامی بۆ خەڵکی گوندەکە نارد و پیاوێکی مل ئەستوری بەهێزی گرت و لێیدا وپێی وت: نامەکەی من بۆ مەصعەب کوڕی زوبەیر ببە. پیاوە بەهێزەکە بەرێکەوت و گەیشتە دێهاتێك کە ئەبو عەمرە هاورێی موختار لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد. موختار ئەوی رەوانە کردبو تا لەو گوندە پایەگایەك لەنێوان ئەو و بەسرە دروست بکات. پیاوی بەهێز چاوی بە کەسێکی بەهێز لەو گوندە کەوت و لەوەی شیمر لەگەڵی کردبو، سکالای کرد. لەم گفتوگۆدا بون کە پیاوێك لەیارانی ئەبو عەمرە لایانەوە تێپەڕی و نامەکەی بینی کەسەرەتاکەی بەمشێوەیە دەستی پێکردبو: بۆ مەصعەب کوڕی زوبەیر، لەشیمرەوە. بەپیاوە بەهێزەکەیان وت: ئەو لەکوێیە؟ ئاگاداری کردنەوە و بینیان لەنێوان ئەوان تا شیمر تەنیا سێ فەرسەخ رێگایە. دەڵێت: بەرێکەوتن ورێگ‌ـەیان بڕی. یارانی شیمر پێیان وتبو: باشترە لەم گوندە بڕۆیت چونکە لەزیان دەترسین. شیمر وتی: ئایا ئەو هەمو ترسە لەدەست ئەم درۆزنەیە! سوێند بەخوا تا سێ رۆژیتر لەم گوندە ناڕۆم. خوا دڵتان لێوانلێو بکات لەترس. ئەوان خەوتبون کە لەناکاو دەنگی سمی ئەسپەکانیان بیست. لەدڵی خۆیاندا وتیان: ئەمە دەنگی فڕینی کولەکانە. دواتر دەنگەکە زیادی کرد. هاورێکانی هەستان و رایان کرد وبینیان ئەسپەکان لەتەپۆلکەکەوە سەرەوخوار بون. سوارەکان

تەکبیریان دەوت و ماڵەکانیان گەمارۆدەدا. هاورێکانی رایان کرد و ئەسپەکانیان بەجێهێشت. شیمر هەستا. قوماشێکی رێ رێی لەخۆیەوە ئالاندبو. پیاوێکی گول بو. سپیەتی گولیەکەی لەژێر قوماشەکەوە دەرکەوت. بەرم شەری لەگەڵ ئەوان کرد چونکە دەرفەتی ئەوەی نەبو کەرەستە و جل وبەرگی شەڕ بپۆشێت. هاورێکانی بەتەنیا جێیان هێشتبو. کاتێك لێی دورکەوتنەوە، دەنگی تەکبیریان بیست و کەسێك کە بەردەوام دەیوت: پیاوی ناپاکی ناپاك زادە کوژرا، کوڕی ئەبی ئەلکنود ئەوی کوشت.

ئەمە ئەو کەسە بو نامەکەی بەپیاوە بەهێزەکەوە بینیبو. لاشەی ئەویان خستە بەردەم سەگەکان. دەڵێت: سەرەتا رمی هەڵگرت و شەری لەگەڵ ئێمە کرد و دواتر بەشمشێر و بەردەوام دەیوت:

| | |
|---|---|
| نبهتم ليث عرين باسلا | جهما محياة يدق الكاهلا |
| لم يريوما عن عدونا كلا | الا كذا مقاتلا او قاتلا |

يبرحهم ضربا و يروى العاملا

یانی: شێرێکی ئازای نیشتەجێی دارستانتان بەخەبەر هێنایەوە، روگرژێك کە پشتی خراپەکاران دەلەرزێنێت. هیچ رۆژێك نەبینراوە لەبەرابەر دوژمن رابکات مەگەر ئەوەی شەرکەر یا کوشتارکەر بوبێت. ئازایانە پەلاماریان دەدات و تینوەکان بەخوێناو تێراو دەکات.

موختار لەگەرەکی سەبیع بۆ کۆشك گەرایەوە وسوراقە کوری مێرداسی بارەقی کە ئەسیر کرابو، هاورێی ئەو بو. سوراقە وتی:

| | |
|---|---|
| امنن على اليوم يا خير معد | و خير من حل بشحر و الجند |

و خير من لبى و حيى و سجد

یانی: لەمن خۆش ببە ئەی باشترین پیاوی مەعد، باشترین پیاوێك کە لەسەرزەمینەکانی شەحر و جند مایەوە، باشترین کەسێك کە وەڵامی داواکاری خوای دایەوە و سڵاوی بۆ خوا نارد و نوێژی خوێند.

موختاری ئەوی خستە زیندان و بەیانی بانگی کرد. ئەوی روی کرد موختار و وتی:

| | |
|---|---|
| الا ابلغ ابا اسحاق انا | نزونا نزوة كانت علينا |
| خرجنا لا نرى الضعفاء شيئا | و كان خروجنا بطرا و حينا |

لقينا منهم ضربا طلحفا — و طعنا صائبا حتى انثنينا

نصرت على عدوك كل يوم — بكل كتيبة تنعى حسينا

كنصر محمد فى يوم بدر — و يوم الشعب اذ لاقى حنينا

فاسجح اذ ملكت فلو ملكنا — لجر نا فى الحكومة و اعتدينا

تقبل توبة منى فانى — ساشكر ان جعلت النقد دينا

یانی، پەیامێك لەمنەوە بە باوکی ئیسحاق بگەیێنە کەئێمە بزوتنەوەیەکی زیان بەخشمان دەست پێکرد و زیانمان پێبرا. هاتین و هەژارەکانمان بەهیچ نەزانی و شۆرش کردنی ئێمە بەهۆی سەرخۆشیەوە بو و بو بەهۆکاری لەناوچونی ئێمە. لەوان زەرەبەیەکی وردکەرمان بەرکەوت و لێدانێك بەرم کە ئێمەی ناچار بەهەلاتن کرد. سەرکەوتو بیت بەسەر دوژمنەکانی خۆت لەهەر شەرێك بەهاوکاری ئەو شەرکەرانەی گیانی بەخشینی حسین دەگێرنەوە. وەك سەرکەوتنی محەممەد لەشەری بەدر و لەشەری دۆلی تەنگانە کەروبەروی خەلکی حونەین بویەوە. کاتێك فەرمان دەدەیت، کە ئەگەر فەرمانبردار دەبوین، لەفەرمان بردن ستەممان کرد و سنورەکانمان بەزاند. بەتۆبەی من بۆ گەرانەوە بۆ لای خوا رازی ببە کەئەگەر قەرزی ئەمرۆم بۆ بەیانی دوا بخەیت، بەردەوام سوپاسی تۆ دەکەم.

دەلێت: کاتێك گەیشتە لای موختار، وتی: خوا فەرماندار باش بکاتەوە. سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نیە، من فریشتەکانم سوار لەسەر ئەسپە سپیەکان بینی کەنێوان زەوی و ئاسمانیان پرکردبو وبەهاوکاری تۆ شەریان دەکرد.

موختار پێی وت: برۆ سەر تەختی وتاردان و خەلك لەمە ئاگادار بکەرەوە. ئەو رۆشتە سەرتەختی وتاردان و ئەم وتارەی هێنایە سەرزمان و هاتە خوار. موختار بەتەنیا لەگەلی دانیشت و پێی وت: باش دەزانم کەهیچ کەسێکت نەبینوە و ئەم درۆت تەنیا لەبەر ئەوە وت بۆ ئەوەی نەتکوژم. لای من رابکە و هاورێکانم دژی من مەبزوێنە. ئەوبەرەو بەسرە بەرێکەوت و لای مەصعەب کوری زوبەیر دابەزی و وتی:

الا ابلغ ابا اسحاق انى — رايت البلق دهما مصمتات

كفرت بوحيكم و جعلت نذرا — على فتالكم حتى الممات

ارى عينى ما لم تبصراه — كلانا عالم بالترهات

یانی: پەیامێك لەمنەوە بەباوکی ئیسحاق بگەیێنن کەمن ئەسپە سپی رەنگەکانم بینی کەبەهیچ شێوەیەك نەیاندەحیلاند. من بە وەحی نهێنی ئێوە ناباوەڕ بوم و لەگەڵ خوا پەیمانم بەست تا رۆژی مەرگ شەڕ لەگەڵ ئێوە بکەم. ئەو شتانەم بەچاوەکانم نیشاندا کە نەیاندیبو، ئێمە هەردوك لەگومانە بێ بنەماکان ئاگادارین.

لەم رۆژەدا عەبدولرەحمان کوڕی قەیسی هەمەدانی کوژرا و سیعر کوڕی ئەبی سیعر کوشتنی ئەوی بۆ خۆی گەڕاندەوە. هەروەها ئەبو زەبیری شیبامی وتی من کوشتومە. شیبام تیرەیەك لەهەمەدانە. کوڕی عەبدولرەحمان بە ئەبوزەبیری وت: ئایا باوکم کەسەروەری خەڵکەکەی بو، کوشتت؟ ئەو ئەم ئایەی خوێندەوە: پیاوە خواپەرستەکان نابینیت کە لەگەڵ دوژمنانی خواوەند وپێغەمبەرەکەی هاورێیەتی دەکەن ئەگەر چی باوکەکان یا کوڕەکان یا براکانیان لەتیرەی ئەوان بێت. ئەوان باوەڕ بەسەردڵیاندا زاڵبوە و خوا باوەڕی لەخۆی بەوان گەیاندوە و دەیانبات بۆ ناو ئەو باخانەی کە روبارەکانی تیا رەوان بێت و ئەوان بۆ هەمیشە لەوێ دەمێننەوە. خوا لەوان رازی دەبێت وئەمان بەرەزامەندی ئەو ژیان بەسەر دەبەن. ئەوان دەستەکانی خوان، بزانن کەدەستەکانی خوا رزگاربوانن (مجادلە/٥٨/٢٢).

کاتێك بای گۆڕەپان دامرکایەوە، بینیان کە حەوتسەد و هەشتا پیاوی شەڕکەر کوژراون. زۆربەی کوژراوەکانی ئەو رۆژە لەخەڵکی یەمان بون. شەڕ شەش رۆژ بۆ کۆتایی زی حەجەی ساڵی شەست و شەش / ٢٢ ژوئیەی ٦٨٦ زایینی رویدا.

گەورەکانی خەڵك بەرەو بەسرە بەرێکەوتن. موختار شوێن بکوژەکانی حسین کوڕی عەلی کەوت و دەستی بەکوشتاری ئەوان کرد. وتی: ئەمە لەئێمە دورە رێگە بدەین بکوژەکانی حسین زیندو بن. هاورێیەکی خراپ بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر بم ئەگەر رێگە بدەم ئەوان زیندو بن. ئەگەر ئەم کارە بکەم، پەرەستاری ئەم جیهانەم، درۆزن بم بەهەمان شێوەکە من بەدرۆزن ناو دەبەن. من لەبەرابەر ئەوان داوای هاوکاری لەخوا دەکەم. ناویان ببەن و دواتر شوێنیان بکەون تا هەمویان کوشتار دەکەن چونکە خواردن و خواردنەوە لەمن حەرامە تا زەوی لەوان پاك دەکەمەوە. سێ کەسیان پێ ناساند: عەبداللە کوڕی ئەسیدی جوهەنی، مالك کوڕی بەشیری بەدی و حەمل کوڕی مالکی موحاربی. موختار کەسی بەدوای ئەواندا رەوانە کرد و لەقادسیەوە ئەوانیان هێنا.

کاتێك ئەوانی بینی، پێی وتن: ئەی دوژمنانی خوا و پێغەمبەر! حسین کوڕی عەلی لەکوێیە؟ حسین بۆ من بگەڕێننەوە! کەسێکتان کوشت کە فەرمانتان پێدرابو سڵاوی بۆ بنێرن. وتیان: خوا لێت خۆش بێت، ئێمەیان بەزۆر برد، لەئێمەخۆش ببە و مەمانکوژە. وتی: بۆ لەحسین خۆش نەبون؟ بۆ نەتان هێشت زیندو بێت؟ بۆ ئاوتان پێ نەدا؟ مالك کوڕی بەشیری بەدی ئەو کەسە بو لەرۆژی عاشورا کلاوەکەی حسین کوڕی عەلی رفاند. فەرمانیدا کەدەست و قاچی ئەویان بڕیەوە و فڕیاندایە سەر زەوی کەدەلەرزی و پەلەقاژەی دەکرد تا گیانی سپارد. ئەو دو کەسیتریشی کوشت. فەرمانیدا و ئەم کەسانەیان هێنایە لای: قیاد کوڕی مالکی زوبعی، عیمران کوڕی خالیدی قوشیری، عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی خوشکارەی بەجلی و عەبداللە کوڕی قەیسی خەولانی. کاتێك ئەوانیان هێنا و چاوی بەوان کەوت، وتی: ئەی بکوژەکانی سەروەری گەنجەکانی بەهەشت، ئەمڕۆ خوا منی کردۆتە فەرمانڕەوا تا تۆڵە لەئێوە بستێنم. ئێسپرەکەی(جۆرە روەکێکە لەرەنگ کردن و نیگارکێشان بەکاری دەبەن) ئێوە ئەمڕۆکە پێگەیشتوە، ئێسپرەکەی ئێوە لەرۆژێکی شووم بۆ ئێوە دەگەڕێتەوە. ئەوان بەشێك لەو ئێسپرکەی حسین لەگەڵ خۆی هێنابوی، رفاندبویان. دواتر فەرمانیدا هەمویان بکوژن. دواتر فەرمانیدا کە عەبداللە کوڕی صەلخت و عەبدولرەحمان کوڕی صەلخت و عەبداللە کوڕی وەهب و عەمرۆ هەمەدانیان هێنا و بێ درەنگ سەریان بڕین. هەروەها عوسمان کوڕی خالید کوڕی ئەسیدی دوهمانی جوهەنی و ئەبو ئەسما بیشر کوڕی شومیتی قانصیان بردە لای. ئەم دوانە لەکوشتار و تالان کردنی عەبدولرەحمان کوڕی عەقیل ببونە شەریك. هەردوکیانی سەربڕی و لاشەکەیانی سوتاند.

دواتر کەسی بەدوای خەولی کوڕی یەزیدی ئەصبەحی (ئەوکەسەی سەری حسین کوڕی عەلی هێنا) رەوانە کرد. ئەو لەناوەڕۆی ماڵەکەی خۆی شاردەوە. هاوڕێیانی موختار رۆشتنە ناو ماڵەکەی و بەدوایدا گەڕان. ژنەکەی عیوف کچی مالك هاتەدەر. لەو رۆژەوەی سەری حسین کوڕی عەلی هێنابویە ناو ماڵەکەی ئەوی بەدوژمن دەزانی. بەوانی وت: چیتان دەوێت؟ وتیان: هاوسەرەکەت لەکوێیە؟ وتی: نازانم ( و بەپەنجە ئاوەڕۆکەی نیشان دەدا) رۆشتن و لەشوێنی خۆشاردنەوەکەی دەریانهێنا و بینیان زەمیڵێیەك یا سەوەتەیەکی بچوکی خستۆتەسەر سەر. ئەویان هێنایەدەر و لەبەرچاوی کەسەکانی سەریان بڕی و لاشەکەیان سوتاند.

## کوژرانی عومەر کوڕی سەعد و بکوژەکانیتری حسین کوڕی عەلی

رۆژێك موختار بەهاورێکانی خۆی وت: بەیانی پیاوێك دەکوژم کە قاچەکانی ئەستور و چاوەکانی بەقوڵاچو بەئەندازەی جمگەی پەنجەیەك، بڕۆکانی پڕ وەك مشت، کوژرانی ئەو دەبێتە هۆکاری شادمانی باوەڕداران و نزیکترین فریشتەکان. هەیسەم کوڕی ئەسوەدی ئەخەعی کە لای ئەو بو، زانی مەبەستی عومەر کوڕی سەعدە. بۆ ماڵەوە گەڕایەوە و کوڕەکەی خۆی عوریان کوڕی هەیسەمی بۆ لای عومەر رەوانە کرد و ئاگاداری کردەوە. کاتێك ئەم قسەی بیست، وتی: خوا پاداشتی چاکەی باوکت بداتەوە، چۆن بەو هەمو سوێند و پەیمانە دەتوانێت من بکوژێت؟ عەبدالله کوڕی جەعدە کوڕی هوبەیرە رێزدارترینی خەڵکان لای موختار بو چونکە پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا هەبو. عومەر کوڕی سەعد لەگەڵ عەبدالله کوڕی جەعدە قسەی کرد تا لەموختار ئەمانی بۆ وەربگرێت. موختار ئەمانی بۆ نوسی بەو مەرجەی عومەر کوڕی سەعد کارێکی ناپەسەندی تازە نەکات. مەبەستەکەی ئەوە بو کەعومەر کوڕی سەعد نەڕواتە شوێنی دەست بەئاوگەیاندن. دوای ڕۆشتنی عوریان کوڕی هەیسەم، عومەر سەعد لەماڵەکەی ڕۆشتەدەر و رۆشتە ناو گەرماو و بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی وت لەنێوان ئەو و موختار چی رویداوە و چۆن ئەمانی وەرگرتوە. کۆیلەکەی پێی وت: کام کارە ناپەسندترە لەو کارەی ئێستا تۆ کردت؟ کەسان و بنەماڵەکەی خۆت پشت گوێ خست و بۆ ئێرە هاتیت! بگەڕێرەوە و بیانوی مەخەرە بەردەست. ئەو گەڕایەوە و بەموختاریان راگەیاند کە عومەر کوڕی سەعد بەرێکەوتوە. موختار وتی: هەرگیز، ئەو زنجیرێکی لەپێدایە کە دەیگەڕێنێتەوە. موختار شەوی گەیاندە بەیانی و ئەبو عەمرەی بۆ لای عومەر کوڕی سەعد رەوانە کرد کە پێی وت: برۆ لای فەرماندار. عومەر هەستا و رەتەڵی برد و کەوتە سەر زەوی. ئەبو عەمرە بەشمشێرەکەی خۆی لێیدا و کوشتی و سەری بڕی و بۆ موختاری نارد. کوڕەکەی حەفص کوڕی عومەر کوڕی سەعد لای موختار دانیشتبو. موختار پێی وت: ئەمە دەناسیت؟ وتی: بەڵێ، دوای ئەو قوڕ بەسەر ژیان! موختار فەرمانیدا و ئەویشیان سەربڕی. دوبارە موختار وتی: عومەر لەبەرابەر حسین و ئەمەیان لەبەرابەر عەلی کوڕی حسین! سوێند بەخوایەتی خوا ئەگەر سێ لەسەر چواری قوڕەیشیەکان کوشتار بکەم، بەئەندازەی جمگەی پەنجەی حسین کوڕی

عەلی بەهای نیە.

پاڵنەری موختار بۆ کوشتنی ئەو ئەمە بو کە یەزید کوڕی شەراحبیلی ئەنساری ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی حەنیفە و سڵاوی لێکرد و قسەی کرد و ئاماژەی بەموختاردا. کوڕی حەنیفە وتی: گومان دەکات لەئێمە شیعەکانە و بکوژەکانی حسین لەدەوری تەختەکەی ئەو دانیشتون و گفتوگۆی لەگەڵ دەکەن.

کاتێك یەزید کوڕی شەراحبیل هاتە لای موختار، لەوتارەکەی محەممەد کوڕی حەنیفە ئاگاداری کردەوە. موختار عومەر کوڕی سەعد و کوڕەکەی کوشت و سەری هەردوکیانی بۆ محەممەد کوڕی حەنیفە ڕەوانە کرد وئاگاداری کردەوە کە هەرکام لەبکوژەکانی حسینی بەردەست کەوتبێت، کوشتویەتی و ئێستا بەشوێن کەسانیترەوەیە تا کوشتاریان بکات.

عەبدالله کوڕی شەریك دەڵێت: من پۆشەرەکانی عابا نیشاندارەکان وکلاوە ڕەشەکانم بینی کەکاتێك عومەر کوڕی سەعد لای ئەوانەوە تێدەپەڕی، دەیانوت: ئەم پیاوە بکوژی حسین کوڕی عەلیە. ئەمە پێش ئەوە بو کە بکوژرێت. ئیبن سیرین دەڵێت: ڕۆژێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەعومەر کوڕی سەعدی وت: ڕۆژێك دەگات کە لەنێوان هەڵبژاردنی دۆزەخ و بەهەشت ئازاد بیت و دۆزەخ هەڵدەبژێریت، ئەو ڕۆژە حاڵت چۆن دەبێت؟

دواتر موختار کەسی بەدوای حەکیم کوڕی توفەیلی تایی ڕەوانە کرد. ئەو جلەکانی لەجەستەی عەباس کوڕی عەلی ڕفاندبو و تیرێکی لەحەسەن دابو. دەیوت: تیرەکەی من بەر پانتۆڵەکەی کەوت و زیانی پێ نەگەیاند. یارانی موختار هاتن و گرتیان. کەسەکانی ڕۆشتنە لای عودەی کوڕی حاتەم و ئەویان کردە نێوەنجیگەر. عودەی قسەی لەگەڵ ئەو کەسانە کرد کە ڕاسپێردرابون بۆ گرتنی. ئەوان وتیان فەرمان بەموختارە. موختار بەنێوەنجیگەری ئەو سەبارەت بەچەند کەسێك لەخەڵکەکەی کە لەڕۆژی شەڕی سەبیع، گرفتار ببون، ڕازی ببو. شیعەکان وتیان: دەترسین موختار بەنێوەنجیگەری ئەو ڕازی ببێت. حەکیمیان تیربارانکرد بەشێوەیەك جەستەی وەك جەستەی ژیشکی لێهات. عودەی کوڕی حاتەم ڕۆشتە لای موختار. موختار لای خۆی دایینیشاند. عودەی سەبارەت بەو نێوەنجیگەری کرد. موختار وتی: ئایا تۆ بەڕەوای دەزانیت داوای بەخشینی بکوژەکانی حسینت لێ بکەن؟ عودەی وتی: درۆیان بۆ هەڵبەستوە. موختار وتی: کەواتە

ئەو بەتۆ دەسپێرین.

لەم کاتەدا عەبدالله کوڕی کاملی شاکری هاتە لای موختار و ئەوی لەکوژرانی حەکیم کوڕی توفەیلی تایی ئاگادار کردەوە. موختار وتی: بۆ پەلەتان کرد؟ بۆنەتانهێنایە لای من؟ ئەو لەدڵەوە بەکوژرانەکەی شادمان بو. عەبدالله کوڕی کامل وتی: نەمتوانی رێگە لەشیعەکان بگرم. عودەی بەکوڕی کاملی وت: درۆت کرد، لەوە ترسایت کە پیاوێك باشتر لەتۆ لەم کارەدا نێوەنجیگەری بکات و کەسێك باشتر لەتۆ بەم کارە رازی ببێت. کوڕی کامل جوێنی پێدا. موختار رێگەی ئەم کارەی لێگرت.

دواتر موختار کەسی بەدوای بکوژەکەی عەلی کوڕی حسین رەوانە کرد کەمونقیز موڕەی عەبدی لەخەڵکی عەبدقەیس بو. پیاوێکی مل ئەستور بو. ماڵەکەیان دەورەدا. سوار ئەسپەکەی خۆی بو و رمێکی بەدەستەوە گرت وبۆ شەڕی ئەوان هاتەدەر. زەربەیەکیان لەدەستی دا و ئەو لەدەست ئەوان هەڵات و رزگاری بو . دواتر پەیوەستی مەصعەب کوڕی زوبەیربو. لەکۆتاییدا دەستی ئیفلیج بو.

دواتر موختار چەند کەسێکی رەوانە کرد کە زەید کوڕی روقادی جونوبیان هێنایە لای. دەیوت: مێردمنداڵێکم لەبنەماڵەی حسین بینی و ویستم تیرێکی بۆ بهاوێژم کە دەستی کردە قەڵغانی خۆی. من دەستیم بەناوچاویەوە دوری بەشێوەیەك نەیتوانی دەستی هەڵبگرێت. ئەو گەنجە عەبدالله کوڕی موسلیم کوڕی عەقیل بو. کاتێك لێمدا، وتی: ئەی خوایە، ئەوان ئێمەیان بەکەم زانی و ریسوایان کردین، بەشێوەیەك بیانکوژە کە ئێمەیان کوشت. تیرێکیتری بۆ ئەو گەنجە هاویشت. دەیوت: هاتمە سەری و بینیم کوژراوە و تیرەکەم لەکەلەکەی دەرهێنا. دەستم بۆ تیرەکەیتر برد کە بەناوچاویەوە بو. راموشاند تا تیرەکە لەجەستەی هاتەدەر و نوکی تیرەکە لەناوچاوانیدا مایەوە. کاتێك یارانی موختار دەوریان گرت، بەشمشێر شەڕی لەگەڵ کردن. عەبدالله کوڕی کامل وتی: شمشێر ورم لەو درێغ بکەن و بەردباران و تیربارانی بکەن. ئەو کارەیان کرد و کەوتە سەر زەوی و ئەوان بەزیندویی ئاگریان تێبەردا.

موختار بەدوای سەنان کوڕی ئەنەس گەڕا کە گومانی دەکرد حسینی کوشتوە. ئەو بۆ بەسرە رایکرد و لەبەر ئەمە ماڵەکەی وێران کرد.

بەدوای عەبدالله کوڕی عوقبەی غەنەویدا گەڕا و زانی کەبۆ جەزیرە رایکردوە. ماڵەکەی

وێران کرد. ئەو گەنجێکی لەبنەماڵەی حسین کوشتبو. بەدوای کەسێکیتر لە بەنی ئەسەددا گەڕا کە پێیان دەوت حەرملە کوڕی کاهن. ئەویش پیاوێکی لەبنەماڵەی حسین کوشتبو. ئەو لەدەستی موختار هەڵات.

هەروەها پیاوێك لەخەسعەم بەناوی عەبدالله کوڕی عوروەی خەسعەمی کە وتبوی: دوانزە تیرم بۆ ئەوان هاویشت. ئەو لەدەست موختار رایکرد و پەیوەستی مەصعەب کوڕی زوبەیر بو. موختار ماڵەکەی وێران کرد.

بەدوای عەمرۆ کوڕی صوبەحی صودایی گەڕا. ئەو دەیوت: بەشمشێرو ڕم لەوانمدا و بریندارم کرد بەڵام کەسم نەکوشت. شەوانە رژانە سەر ماڵەکەی و ئەویان بردە لای موختار. فەرمانیدا بەرم ئەوەندەیان لێدا تا گیانی سپارد.

دوبارە موختار کەسی بەدوای محەممەد کوڕی ئەشعەس رەوانە کرد کە لەگوندێکی نزیك قادسیە بو. ئەویان نەدۆزیەوە. ئەو بۆ لای مەصعەب هەڵاتبو. موختار ماڵەکەی وێران کرد و بەخشت و گڵەکەی ماڵێکی بۆ حوجر کوڕی عودەی دروست کرد کە زیاد کوڕی سومەیە وێرانی کردبو.

## بەیعەت وەرگرتنی موسەنا کوڕی عەبدی بۆ موختار لەبەسرە

لەم ساڵەدا موسەنا کوڕی موخەریبەی عەبدی پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ موختاری بەخەڵکی بەسرە کرد. ئەو لەو کەسانە بو لە شەڕی عەین ئەلوەردە هاوڕێیەتی سولەیمان کوڕی سوردی خوزاعی کردبو. دواتر گەڕایەوە و لەگەڵ موختار بەیعەتی کرد. موختار ئەوی بۆ بەسرە رەوانە کرد تا خەڵکان بۆ بەیعەت لەگەڵ موختار هان بدات. ئەو ڕۆشتە بەسرە و بانگەوازەکەی خۆی دەستپێکرد. پیاوانێك لەخەڵکان وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوە. ئەو ڕۆشتە (شاری رۆژی) و لەشکرگەکەی لەوێ دروست کرد. لەوێ خۆراك و توێشویان کۆکردەوە. قوباع فەرمانداری بەسرە دەستەیەکی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان رەوانە کرد. لەوێ عوباد کوڕی حوصەین سەرکردەی پاسەوانەکان و قەیس کوڕی هەیسەم فەرماندەی شەڕکەرانی بانگ کرد. ئەوان بەرەو سەبخە بەرێکەوتن. خەڵك لەماڵەکانی خۆیان مانەوە و کەس نەهاتەدەر. عوباد لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی برد. ئەو و موسەنا روبەروی یەك بونەوە. عوباد بەرەو شاری رۆژی ئەسپی غاردا و قەیسی کردە جێگری خۆی.

کاتێك عوباد ڕۆشتە شاری ڕۆژی، سێ پیاوی بۆ سەر دیوارەکەی ڕەوانە کرد و پێی وتن: کاتێك دەنگی تەکبیرتان بیست، تەکبیر بڵێن. عوباد بۆ لای قەیس گەڕایەوە. ئەوان سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ موسەنا بون. ئەو پیاوانەی لەشاری ڕۆژی بون، دەنگی تەکبیریان بیست و تەکبیریان وت. ئەو کەسانەی لەشاری ڕۆژیدا بون، ڕایان کرد. موسەنا و هاورێکانی لەپشت سەری خۆیانەوە دەنگی تەکبیریان بیست و هەڵاتن. عوباد و قەیس دەستیان لێهەڵگرتن و شوێنیان نەکەوتن.

موسەنا ڕۆشتە لای خەڵکەکەی خۆی لەعەبدقەیس. قوباع سوپایەکی بۆ سەر خەڵکی عەبدقەیس ڕەوانە کرد کە موسەنا و هاورێکانیان بڕدە لای ئەو. کاتێك زیاد کوڕی عەمرۆ عەتەکی ئەمەی بینی، ڕۆشتە لای قوباع و وتی: دەبێت سوارەکانی خۆت لەبەرابەر براکانی ئێمە بکشێنیتەوە و گەرنە شەڕیان لەگەڵ دەکەین. قوباع، ئەحنەف کوڕی قەیس و عومەر کوڕی عەبدولرەحمانی ڕەوانە کرد تا ئاشتی لەناو خەڵکدا سەقامگیر بکەن. ئەحنەف بەمشێوەیە ئاشتی سەقامگیر کرد کە موسەنا و هاورێکانی لەناو ئەوان نەمێنن. ئەوان ڕازی بون و موسەنا و هاورێکانیان دەرکرد. موسەنا لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی بۆ کوفە گەڕایەوە.

## فێڵی موختار لەگەڵ کوڕی زوبەیر

کاتێك موختار نوێنەری کوڕی زوبەیری لەکوفە دەرپەڕاند (کوڕی موتیع)، ئەو بەرەو بەسرە بەڕێکەوت چونکە حەزی نەدەکرد تێکشکاو بڕواتە لای عەبداللە کوڕی زوبەیر. کاتێك موختار کاروباری کوفەی ساماندا، فێڵ و فریوی لەگەڵ کوڕی زوبەیر بەکار بەست. بۆی نوسی: زانیم کە چاکەی منت دەوێت و من لەگەڵ دوژمنانی تۆ شەڕ دەکەم و ڕێگە بۆ تۆ تەخت دەکەم. تۆ خۆت بەڵێنت پێدام ئەگەر ئەم کارە بکەم، ئەوەم پێدەبڕێت. من مەبەستەکەی تۆم هێنایەدی و ئەوەی ویستت، ئەنجاممدا بەڵام تۆ ڕێزت لەپەیمانەکەی خۆت نەگرت. ئەگەر نەتەوێت یەکڕەنگ لەگەڵ من بمێنیتەوە و ڕێگەی چاکەخوازی من نەگریتەبەر، کارێك دەکەم، کەخۆم دەیزانم. ماڵئاوا.

مەبەستی موختار ئەوەبو کوڕی زوبەیر دەستی لێ هەڵگرێت تا کاروبارەکان سامان دەدات. شیعەکان لە کارەکانی ئەو تێنەدەگەیشتن. کوڕی زوبەیر دەیویست بزانێت موختار ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەو دەگرێتەبەر یا جەنگ. لەسەر ئەم بنەمایە، عومەر کوڕی

عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هشامی مەخزومی بانگ کرد و فەرمانداری کوفەی پێ سپارد. پێی وت: موختار فەرمانبەر و گوێرایەڵە. ئەو سی تا چل هەزار درەمی هەڵگرت و روی لەکوفە کرد. هەواڵی ئەم کارە بەموختار گەیشت. ئەو زایدە کوڕی قودامەی بانگ کرد وحەفتا هەزار درەمی پێدا و پێی وت: ئەمە دوبەرابەری ئەوە پارەیە کەعومەر کوڕی عەبدولرەحمان هەڵیگرتوە. فەرمانی پێدا پێنسەد سوار هەڵگرێت و بەرێکەوێت تا لەرێگە پێی بگات، پارەکەی بداتێ و بیگەرێنێتەوە. ئەگەر گەڕایەوە، چ باشتر و گەرنە شەڕی سوارکارە شەرکەرەکانی نیشان بدات.

زاید کوڕی قودامە درەمەکانی هەڵگرت و رەوانە بو تا چاوی بەعومەر کەوت. سامانەکەی پێدا و فەرمانی پێدا لەو رێگەی هاتوە، بگەرێتەوە. عومەر کوڕی عەبدولرەحمان پێی وت: سەروەری باوەڕداران منی وەك فەرمانداری کوفە دەست نیشان کردوە، بەناچار دەبێت بۆ ئەو شارە بڕۆم. زاید سوارەکانی بانگ کرد. ئەوانی لەسەر رێگەکەدانابو. کاتێك سوارەکانی بینی، درەمەکانی وەگرت و بۆ بەسرە گەڕایەوە. ئەو و کوڕی موتیع لەژێر فەرمانڕەوایەتی حارس کوڕی ئەبی رەبیعە کۆبونەوە. ئەمە پێش دەسپێکردنی بزوتنەوەی موسەنا کوڕی موخەریبەی عەبدی لەبەسرە بو.

دەستەیەك دەڵێن: موختار بۆ کوڕی زوبەیری نوسی: من کوفەم وەك ماڵی خۆم هەڵبژاردوە. ئەگەر ئەم شارە بەمن ببەخشیت و فەرمان بدەیت کە هەزار هەزار (یەك ملیۆن) درەم بەمن ببەخشن، دەڕۆمە شام و زیانی کوڕی مەروان (عەبدولەلیك کوڕی مەروان) لەتۆ دور دەخەمەوە. کوڕی زوبەیر وتی: تا کەی دەبێت بەفریوەکانی پیاوی درۆزنی سەقیف رازی ببم؟ تا کەی دەبێت رێگە بدەم فێڵ لەمن بکات؟ دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە: .

عاري الجواعر من ثمود اصله          عبد و يزعم ا نه من يقدم

یانی: لەگەڵ ئەو کەسانەی جنگ و دیانیان هەیە، بەردەوام روبەرو دەبێتەوە، نەژادی لەخەڵکی سەمودە، کۆیلەیە و گومان دەکات لەپێشەنگەکانە. .

نامەی بۆنوسی: سوێند بەخوا یەك درەم بەتۆ نادەم.

و لا امتري عبد الهوان ببدربي          و انی لاتی الحتف مادمت اسمع

یانی: کۆیلەیەکی ریسوا بەرەو لای خۆم راناکێشم، بەڵکو تا ئەو کاتەی زیندوم، بەرەو

مەرگ پێشڕەوی دەکەم.

دواتر عەبدولەلیک کوڕی مەوران، عەبدولەلیک کوڕی حارس کوڕی ئەبی ئەلحەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاصی بۆ وادی ئەلقورا رەوانە کرد. موختار رێگەی ئاشتی و سازانی لەگەڵ کوڕی زوبەیر گرتبوەبەر و پەیمانێکی نەنوسراوی لەگەڵ بەستبو تا کاری پێی نەبێت بۆ ئەوەی بەئاسودەی سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ خەڵکانی شام بێت. موختار بۆ کوڕی زوبەیری نوسی: بیستومە کوڕی مەروان سوپایەکی کردۆتەسەر تۆ، ئەگەر بتەوێت هاوکاریت دەکەم.

کوڕی زوبەیر بۆی نوسی: ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی من دەبێت، لەخەڵکەکەی دەوروبەرت بەیعەت وەربگرە و لەرەوانە کردنی سوپا پەلە بکە. فەرمانیان پێدە بڕۆنە لای خەڵکی وادی ئەلقورا و لەگەڵ هێزەکانی عەبدولەلیک کوڕی مەروان روبەرو ببنەوە. ماڵئاوا.

موختار، شورەحبیل کوڕی وەرسی هەمەدانی بانگ کرد و ئەوی لەگەڵ سێ هەزار شەرکەر لەمەوالی رەوانە کرد. تەنیا حەوتسەد عەرەب لەناو سوپاکەی ئەواندا بون. پێی وت: بەرێکەوە تا بگەیتە مەدینە و کاتێك گەشتیتە ئەو شارە، نامەم بۆ بنوسە و ئاگادارم بکەرەوە تا فەرمان بدەم چ کارێك بکەیت. مەبەستەکەی ئەوە بو کاتێك ئەوان بڕۆنە مەدینە، فەرماندارێك بۆ ئەوان دەست نیشان بکات و دواتر بەکوڕی وەرس فەرمان بدات بڕواتە مەککە و گەمارۆ بخاتە سەر کوڕی زوبەیر. کوڕی زوبەیر ترسا موختار فێڵ بەکار ببات. لەبەر ئەمە، عەباس کوڕی سەهل کوڕی سەعدی هاورێ لەگەڵ دو هەزار شەرکەر لەمەککەوە رەوانە کرد و پێی وت: ئەگەر زانیت ئەوان فەرمانبەرن، چ باشتر و گەرنە فریویان بدە تا لەناویان دەبەیت.

عەباس کوڕی سەهل بەرێکەوت تا لەرەقیم چاوی بەشورەحبیل کوڕی وەرسی هەمەدانی کەوت و بینی کوڕی وەرس هاورێکانی بۆ شەڕ رێکخستوە. عەباس کاتێك گەیشت کە هاورێکانی کەرت کەرت و بڵاوببونەوە. کوڕی وەرسی لەسەر کانیەکە بینی کەهاورێکانی بۆ شەڕ ئامادە و تەیارن. لێی نزیك کەوتەوە و سڵاوی بۆنارد و دواتر بەتەنهێنی بەشورەحبیل کوڕی وەرسی وت: مەگەر ئێوە فەرمان لە کوڕی زوبەیر نابەن؟ وتی: با. وتی: کەواتە لەگەڵمان بەرێکەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەینە سەر دوژمنەکانی لەوادی

ئەلقورا. شورەحبیل کوڕی وەرس وتی: فەرمانیان بەمن نەداوە فەرمانەکانی تۆ جێبەجێ بکەم، فەرمانیان پێداوم بڕۆمە مەدینە. کاتێك گەشتمە ئەوێ چاوەڕوان دەبم بۆ ئەوەی بزانم دەبێت چ کارێك بکەم. عەباس کوڕی سەهل پێی وت: ئەگەر فەرمان لەکوڕی زوبەیر دەبەن، فەرمانی بەمن داوە کە ئێوە بۆ وادی ئەلقورا ببەم. وتی: فەرمانەکەی تۆ پشت گوێ دەخەم و دەڕۆمە مەدینە و هەواڵی کارەکانی خۆم بۆ سەروەری خۆم دەنوسم تا فەرمانی پێویست رەوانە بکات. عەباس کوڕی سەهل وتی: بۆچونی تۆ باشترە. لەدڵی خۆیدا زانی مەبەستەکەی چیە. وتی: بەڵام من بۆ وادی ئەلقورا غار دەدەم.

عەباس کوڕی سەهل دابەزی وەمەڕ وماڵاتی بۆ شورەحبیل کوڕی وەرس رەوانە کرد کە لەبرساندا خەریك بو دەمردن. ئەوان مەڕوماڵاتیان سەربڕی و سەرقاڵ بون و لەسەر ئاو کردیانە شەڕ. عەباس کوڕی سەهل نزیکەی هەزار شەڕکەری ئازای لەسوپاکەی خۆی کۆکردەوە و مەبەستی خێوەتەکەی شورەحبیل کوڕی وەرسی کرد. کاتێك ئەوانی بینی، بانگی هاورێکانی خۆی کرد. لەوان جگە لەسەد کەس، کەس لەدەوری کۆنەبویەوە. عەباس کوڕی سەهل پێی گەیشت و هەردولای شەڕکەر شەڕیان دەست پێکرد. شورەحبیل کوڕی وەرس و حەفتا کەس لەهاورێ نزیکەکانی کوژران. عەباس کوڕی سەهل ئاڵای ئەمانی هەڵکرد کە هەمویان جگە لەسێسەد کەس لەدەوری ئاڵاکە کۆبونەوە. سلێمان کوڕی حەمیری هەمەدانی و عەباس کوڕی جەعدەی جەدەلی هاورێی ئەوان بون. عەباس کوڕی سەهل نزیکەی دوسەد کەس لەوانی گرت و کوشتاری کردن وکەسانیتر هەڵاتن و گەڕانەوە و زۆربەیان لەرێگادا تیاچون.

موختار هەواڵی ئەم کارەی بۆ کوڕی حەنیفە نوسی و وتی: من سوپایەکم بۆ تۆ رەوانە کرد تا دوژمنەکانت ریسوا بکات و شارەکان بۆ تۆ ئارام و دەستەمۆ. کاتێك گەیشتنە تیبە، ئەم بەلایان بەسەر هات. ئەگەر دەتەوێت، سوپایەکی گەورە بۆ هاوکاری تۆ رەوانە دەکەم و تۆیش لەلایەن خۆتەوە پیاوێك دەکەیتە سەرکردەی ئەوان تا خەڵك بزانن من ملکەچی فەرمانەکانی تۆم. ئەگەر ئەم کارە بکەیت، دەبینی زیاتر لەوان ماف دەناسن و لەگەڵ بنەماڵەی کوڕی زوبەیر لەگەڵ ئێوە مێهرەبانترن. ماڵئاوا.

کوڕی حەنیفە بۆی نوسی: دوای سڵاو، نامەکەی تۆم خوێندەوە و ئاگادار بوم

کەماڵەکانی من بەرەوا دەزانیت و لەدڵەو دەتەوێت من شادمان بکەیت. خۆشەویست ترین کار لای من ئەوەیە کەفەرمان لەخوا ببەم. تۆیش تا ئەو جێگەی دەتوانی فەرمانەکانی خوا ئەنجام بدە. ئەگەر من مەبەستی شەڕکردنم دەبو، هاورێی زۆرم دەبینی و خەڵکانم لەدەوری خۆم کۆدەکردەوە. بەڵام من خۆم لەئێوە بەدور دەگرم و خۆڕاگری دەکەمە پیشە، تا خوا فەرمانەکانی خۆی ڕەوانە بکات کە بەهێزترین فەرمانەکانن.

فەرمانی پێدا رێگە لەخوێن رشتن و کوشتار بگرێت.

## هەڵس و کەوتی کوڕی حەنیفە لەگەڵ کوڕی زوبەیر رەوانە بونی سوپا لەکوفەوە

دواتر کوڕی زوبەیر، محەممەد کوڕی حەنیفە و بنەماڵەکەی و حەفدە کەس لەگەورەکانی کوفەی بانگ کرد. یەکێك لەوان ئەبوئەلتەفیل عامر کوڕی واسلە بو کە لەهاوەڵانی پێغەمبەر هەژمار دەکرا. داوای لەوان کرد بەیعەتی لەگەڵ بکەن بەڵام ئەوان رازی نەبون و وتیان: بەیعەت ناکەین تا خەڵکان لەسەر یەك کەس رێکبکەون. ئەو بە توندی قسەی لەگەڵ کوڕی حەنیفە کرد و سەرکۆنەی کرد. عەبدالله کوڕی هانی کێندی وتی: ئەگەر تەنیا زیانی تۆ لەرێگەی بەیعەت نەکردن لەگەڵ ئێمە بێت، هیچ زیانێکت پێ ناگات. گەورەی ئێمە دەفەرمێت: ئەگەر هەمو خەڵکان بەیعەت لەگەڵ من بکەن و سەعدّ (کۆیلەی معاویە) نەیکات، رازی نابم. لەبەر ئەوە ئاماژەی بەسەعد دا چونکە کوڕی زوبەیری کەسی ناردبو و کوشتبوی. عەبدالله کوڕی حەنیفە و هاورێکانی سەرکۆنە کرد و لای خۆی دەریکردن. ئەوان کوڕی حەنیفەیان ئاگادار کردەوە. داوای لێکردن خۆڕاگربن. کوڕی زوبەیر زیاتر پێداگری دەکرد.

کاتێك موختار بەسەر کوفەدا زاڵبو و شیعەکان بانگەواز بۆ رێبەرایەتی کوڕی حەنیفەیان دەست پێکرد، کوڕی زوبەیر ترسا خەڵك یەکتر بۆ فەرمان بردن لەو هان بدەن. زەختی لە کوڕی حەنیفە و هاورێکانی کرد بۆ ئەوەی بەیعەت بکەن. ئەوانی لەزەمزەم زیندانی و هەڕەشەی کوشتن و سوتاندنی لێکردن و سوێندی خوارد ئەگەر بەیعەت نەکەن، وتەکانی خۆی دەهێنێتەدی. کاتێکی بۆ دیاری کردن کە تیایدا

بەڵێنەکانی خۆی دەهێنێتەدی.

دەستەیەك لەو کەسانەی لەگەڵ کوڕی حەنیفە بون، پێشنیاریان پێکرد کەسێك بۆ لای موختار رەوانە بکات و ئاگاداری بکاتەوە. ئەو نامەی بۆ موختار نوسی و داوای هاوکاری لێکرد. موختار نامەکەی بۆ خەڵك خوێندەوە و وتی: ئەمە سۆشیانەکەتان و ئەژادی پاکی پێغەمبەرەکەتان. ئەوانیان لەناو چواردیواریەك زیندانی کردوە بەهەمان شێوە کە مەڕوماڵات زیندانی دەکەن. ئێستا بەدرێژایی شەو و رۆژ چاوەڕوانی کوشتن و سوتاندنن. باوکی ئیسحاق نەبم ئەگەر هاوکاریەکی گەورە و گران بۆ ئەوان رەوانە نەکەم. ئەگەر سوپاییەکان هاوشێوە شەپۆلە خرۆشاوەکان بەدوای یەکدا نەنێرم بۆ ئەوەی رۆژگار لەکوڕی کاهلییە پاك بکەمەوە.

مەبەستی لەکوڕی کاهلییە کوڕی زوبەیر بو. چونکە دایکی خوەیلد ئەبو عەوام، زوهرە کچی عومەر لەبەنی کاهل کوڕی ئەسەد کوڕی خوزەیمە بو.

خەڵك گریان و وتیان: ئێمە رەوانە بکە و پەلە بکە. ئەو ئەبو عەبداللە جەدەلی هاوڕێ لەگەڵ حەفتا سوارەی بەهێز رەوانە کرد و زەبیان کوڕی عومارەی هاوڕێ لەگەڵ چوارسەد شەڕکەر و بەودا چوارسەد هەزار درەمی بۆ کوڕی حەنیفە رەوانە کرد. ئەبو مەعمەر لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر، هانی کوڕی قەیس لەگەڵ سەد شەڕکەر، عومەیر کوڕی تارق لەگەڵ چل شەڕکەر و یونس کوڕی عیمرانی بەچل شەڕکەر رەوانە کرد(هەمویان نزیکەی ٧٥٠ شەڕکەر). ئەبو عەبداللە جەدەلی گەیشتە زات عێرەق و لەوێ چاوەڕوانی کرد تا عومەیر و یونس لەگەڵ هەشتا سوارەکەی خۆیان پەیوەستی بون. هەمویان بونە سەد و پەنجا پیاوی شەڕکەر. ئەوان بەرێکەوتن تا گەیشتنە ناو (المسجد الحرام) و ئاڵاکان لەدەستیاندا دەشەکایەوە. هاواریان دەکرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی حسین دەکەن! سەرئەنجام گەیشتنە زەمزم و بینیان کوڕی زوبەیر هەمویانی کۆکردۆتەوە تا بیانسوتێنێت. تا کاتە دیاریکراوەکەی کوڕی زوبەیر بۆ کوشتنی ئەوان دو رۆژی مابو. دەرگایان شکاند و ڕۆشتنە لای کوڕی حەنیفە. پێیان وت: ئێمە لەگەڵ دوژمنی خوا کوڕی زوبەیر روبەرو بکەرەوە! بەوانی وت: من شەڕ و خوێنڕێژی لەبارەگایی خوایی پەسەند ناکەم. کوڕی زوبەیر وتی: هاوار لەداربەدەستەکان! بەجۆرێك باسی مەرگی حسین دەکەن وەك بڵێی من ئەوم کوشتوە.

سوێند بەخوا ئەگەر بکوژەکانیم دەست کەوێت، کوشتاریان دەکەم.

لەبەر ئەمە پێیان وتن داربەدەستەکان چونکە دوای ئەوەی هاتنە مەککە، گورزی دارینیان هەڵگرت چونکە حەزیان نەدەکرد لەبارەگایی خوا شمشێر لەکالآن دەربکێشن. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوەبو چونکە ئەو چیلکە و دارانەی کوڕی زوبەیر کۆی کردبویەوە، دەستیان بەسەرداگرت.

کوڕی زوبەیر وتی: ئایا گومان دەکەن، دەست بەرداری ئەوان ببم بێ ئەوەی بەیعەت بکەن؟ جەدەلی وتی: بەڵێ، سوێند بەخوای گەورە، بێ گومان دەبێت دەستبەرداری بیت وەگەرنە بەجۆرێك بەشمشێر هێرشت دەکەینە سەر، کە هەڵیت و پڵیت بێژەکان لەزیانەکەی بکەونە سواڵ کردن! کوڕی حەنیفە هاوڕێکانی خۆی دورخستەوە و ئەوانی لەئاژاوە نانەوە ترساند.

دواتر سوپاییەکانیتر باسامانەکەوە هاتن و ڕۆشتنە ناو المسجد الحرام و تەکبیریان وت و هاواریان کرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی حسین دەکەن! کوڕی زوبەیر لەوان ترسا. محەمەد کوڕی حەنیفە لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی ڕۆشتە دۆڵی عەلی. ئەوان بەردەوام جوێنیان بەکوڕی زوبەیر دەدا و داوای فەرمانیان لە کوڕی حەنیفە دەکرد تا لەناوی ببەن. ئەو بەم کارە رازی نەبو. هاورێ لەگەڵ محەممەد کوڕی حەنیفە، چوار هەزار پیاوی شەڕکەر لەدۆڵی عەلی کۆبویەوە. ئەو درەمەکانی لەناو ئەواندا دابەش کرد و بەمشێوەیە رێزی لێگرتن.

کاتێك موختار مرد، ئەوان لەشوێنەکەیان هەڵتەکێنران و نیازمەند بون. دواتر بەدوای کوژرانی موختار، شارەکان بۆ کوڕی زوبەیر ئارام بون. ئەو کەسی بەدوای محەممەد کوڕی حەنیفە رەوانە کرد و وتی: وەرە ژێر فەرمانی من وەگەرنە شەڕ لەگەڵ تۆ دەکەم. نێردراوەکەی عوروە کوڕی زوبەیر بو. کوڕی حەنیفە وتی: ئێزمون بێت، براکەت، چەندە پیاوێکی پەلەیە بۆ تورە بونی خواوەند. بەهاوڕێیانی خۆی وت: کوڕی زوبەیر دەیەوێت شەڕ لەگەڵ ئێوە دەست پێ بکات، هەر کەس دەیەوێت بڕوات و جیا ببێتەوە، من فەرمانی پێدەدەم. هیچ پەیمانێك لەئێمەوە لەگەردنی ئێوەدا نیە و ئێمە سەرکۆنەی ئێوە ناکەین. من دەمێنمەوە تا خوا لەنێوان من و کوڕی زوبەیر داوەری بکات چونکە ئەو باشترینی داوەرەکانە.

ئەبو عەلی جەدەلی و کەسانیتر هەستان و ئاگاداریان کردەوە کەلێی جیا نابنەوە. هەواڵی ئەم کارە بە عەبدولمەلیك کوڕی مەروان گەیشت. نامەیەکی بۆ نوسی و ئاگاداری کردەوە ئەگەر بڕواتە لای ئەو، چاکەی لەگەڵ دەکات وڕێزی دەگرێت. ئەگەر دەیەوێت، بێت و لەشام ماڵێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت تا کاروباری خەڵك سامان دەدرێت. کوڕی حەنیفە لەگەڵ هاوڕێکانی بەرەو شام بەرێکەوتن. کەسیری عیزەت لەگەڵ ئەوان ڕۆشتەدەر و بەردەوام دەیوت:

هديت يا مهدينا ابن المهتدی　　　انت الذی نرضی به و نهتدی

انت ابن خير الناس بعد النبی　　　انت امام الحق لسنا نمتری

يابن علی سر و من مثل علی

یانی: خۆزگە بەردەوام رزگار بیت ئەی سۆشیانسی رزگار بوی ئێمە، تۆ ئەو کەسەی بەفەرمانەکانی رازی دەبین و رەزامەندین. تۆ باشترینی خەڵکان دوای پێغەمبەریت، تۆ رێبەری راستی و دروستیت کە ئێمە لەمەدا هیچ گومانێکمان نیە. ئەی کوڕی عەلی بۆ پێشەوە بڕۆ بەڵام کێ دەتوانێت وەك عەلی بێت.

کاتێك گەشتە مەدینە، ئاگاداریان کردەوە کە عەبدولمەلیك کوڕی مەروان پەیمان و سوێندەکەی خۆی سەبارەت بەعەمرۆ کوڕی سەعید خستۆتە ژێرپێ. لەڕۆشتن بۆ لای ئەو پەشیمان بویەوە و ترسا. لەئوبلە دابەزی. خەڵك سەبارەت بەلەپێشی و رێزداری و خۆپارێزی و خواپەرەستی محەممەد کوڕی حەنیفە قسەیان کرد. کاتێك ئەم وتانە بەگوێ عەبدولمەلیك گەیشت، پەشیمان بویەوە کەفەرمانی مانەوەی لەوڵاتەکەی خۆی بۆ نوسیوە. بۆی نوسی: ئەو کەسەی بەیعەت لەگەڵ من نەکات، ناتوانێت لەوڵاتەکەی من بمێنێتەوە. محەممەد بۆ مەککە ڕۆشت و لەدۆڵی ئەبوتالیب مایەوە. کوڕی زوبەیر کەسی بۆ لای ئەو رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لای ئەو بڕوات. نامەی بۆ براکەی مەصعەب کوڕی زوبەیر نوسی و فەرمانی پێدا ژنانی هاوڕێی محەممەد کوڕی حەنیفە رەوانە بکات. ئەو ژنەکانی دەرکرد کە ژنی ئەبوئەلتفیل عامر کوڕی واسیلە یەکێك بو لەوان. ژن بەرێکەوت تا گەیشتە لای. تەفیل هۆنراوەیەکی هۆنیەوە:

ان تك سيرها مصعب　　　فانی الی مصعب متعب

اقود الكتيبة مستلئما　　　كا نی اخو غزة احرب

یانی: ئەگەر مەصعەب ئەم ژنانەی دەرکردوە، منیش بەرەنج و ئازارەوە بەرەو مەصعەب دەڕۆم، دەستەیەکی شەڕکەری زرێپۆش فەرماندەیی دەکەم وەك بڵێی هێزی زۆرم لەبەردەستایە و بەهاوکاری ئەوان دەجەنگم.

ئەم هۆنراوەیە چەندین بەیتی دوورودرێژە.

کوڕی زوبەیر زەختی لەکوڕی حەنیفە کرد وپێداگری گرت تا بڕواتە ناو مەککە. هاورێکانی داوای فەرمانیان لێکرد تا لەگەڵ کوڕی زوبەیر شەڕ بکەن. ئەو فەرمانی نەدا و وتی: ئەی خوایە، جل و بەرگی ترس و ریسوایی لەبەر کوڕی زوبەیر بکە و کەسێك بکەرە فەرمانڕەوای خۆی و هاورێکانی کە ئەو بەلایان بەسەر بێنن کەئەمڕۆ بەسەر ئەم خەڵکەی دەهێنن.

دواتر بەرەو تاییف بەرێکەوت. کوڕی عەباس ڕۆشتە لای کوڕی زوبەیر و بەتوندی قسەی لەگەڵ کرد. لەنێوان ئەوان شەرە قسەیەك دروست بو کەنێمە پەسەندمان نەکرد لێرەدا ئاماژەی پێبدەین. عەبداللە کوڕی عەباس ڕۆشتەدەر و لەتاییف نیشتەجێ بو. دواتر مرد. محەممەد کوڕی حەنیفە نوێژی لەسەر خوێند و چوار جار تەکبیری وت. کوڕی حەنیفە مایەوە تا ئەو کاتەی حەجاج گەمارۆی خستە سەر کوڕی زوبەیر. لەم کاتەدا لەتاییف هاتەدەر و لە(دۆڵ) نیشتەجێ بو. حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی بەدوایدا گەڕا تابیبات و لەگەڵ عەبدولەلیك بەیعەت بکات. کوڕی حەنیفە رازی نەبو و وتی ئەو کارە ناکات تا خەڵك لەسەر یەك رێبەر رێککەون.

کاتێك کوڕی زوبەیر کوژرا، کوڕی حەنیفە نامەیەکی بۆ عەبدولەلیك نوسی و داوای ئەمانی بۆ خۆی و هاورێکانی کرد. حەجاج کەسی رەوانە کرد و داوای لێکرد بەیعەت لەگەڵ عەبدولەلیك بکات. محەممەد کوڕی حەنیفە رازی نەبو و وتی: نامەم بۆ عەبدولەلیك نوسیوە، هەر کاتێك وەلامەکەم گەیشت، بەیعەت دەکەم.

عەبدولەلیك نامەی بۆ حەجاج کوڕی یوسف نوسیبو وپێشنیاری چاکەکردن لەگەڵ کوڕی حەنیفەی پێدابو. حەجاج دەستی لێ هەڵگرت. کاتێك نێردراوەکەی کوڕی حەنیفە گەڕایەوە و نامەی عەبدولەلیکی هێنا کە ئەمانی بەمحەممەد دەبەخشی و مافەکانی بەرەوا و رێزی لەبنەماڵەکەی دەگرت، کوڕی حەنیفە ڕۆشتە لای حەجاج و لەگەڵ عەبدولەلیك بەیعەت بەست. دواتر ڕۆشتە شام بۆ لای عەبدولەلیك و داوای لێکرد

دەستی حەجاج لەسەر ئەو کورت بکاتەوە. عەبدولمەلیك ئەو کارەی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: کوڕی زوبەیر کەسی بۆ لای عەبداللە کوڕی عەباس و محەممەد کوڕی حەنیفە رەوانە کرد و داوای لێکردن بەیعەت بکەن. وتیان: هەرکات خەڵك لەسەر یەك رێبەر رێککەوتن، بەیعەت دەکەین. ئێستا تۆ گیرۆدەی ئاژاوەیەکی سەراسەریت. کێشە لەناو ئەواندا دروست بو و کوڕی زوبەیر کینەی ئەو دوانەی لەدڵ گرت و کوڕی حەنیفەی لەزمزم و کوڕی عەباسی لەماڵەکەیدا دەستبەسەر کرد و بڕیاریدا هەردوکیان بسوتێنێت. موختار بەهەمان شێوە کەئامازەی پێدرا، سوپایەکی رەوانە کرد و زیانی کوڕی زوبەیر لەو دوانە دورخستەوە.

کاتێك موختار کوژرا، کوڕی زوبەیر هێزی وەرگرت و وتی: لەنزیك من مەمێننەوە. ئەو دوانە هاتنەدەر و رویان لەتایف کرد. عەبداللە کوڕی عەباس کوڕەکەی عەلی بۆ لای عەبدولمەلیك لەشام رەوانە کرد و پەیامیدا کە: ئەگەر کوڕە مامی من چاودێریم بکات و پەروەردەم بکات باشترە لەوەی پیاوێك لەبەنی ئەسەد رێزم لێ بگرێت. مەبەستی لەکوڕە مام (ئومەوییەکان) بو چونکە لەگەڵ هاشمیەکان لەیەك باوەگەورێ (عەبد مەناف) بون. مەبەستی لەپیاوی ئەسەدی کوڕی زوبەیر بو چونکە ئەو نەژادی دەگەڕایەوە بۆ بەنی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی قوصەی. کاتێك عەلی کوڕی عەبداللە گەیشتە لای عەبدولمەلیك، پرسیاری ناو و نەژادی کرد. وتی: باوکی حەسەن، عەلیم، کوڕی مەروان وتی: کەسێك بەناوی (باوکی حەسەن، عەلی) بۆ سوپاکەی من شیاو نیە، تۆ باوکی محەممەدیت.

کاتێك کوڕی عەباس گەیشتە تاییف، لەوێ مرد و کوڕی حەنیفە نوێژی لەسەر خوێند.

## ئاژاوە لەخوراسان

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی خازم، گەمارۆی خستە سەر ئەو کەسانەی نیشتەجێی خوراسان بون و ئەمە لەبەر ئەوە بو چونکە ئەوان کوڕەکەی ئەو یانی محەممەد-کوڕی عەبداللە یان کوشتبو. ئامازەمان بەم روداوەدا. کاتێك بەنی تەمیم لەخوراسان بڵاوبونەوە، دەستەیەك لەهێزە سوارەکارەکانی ئەوان نزیکەی حەفتا تا هەشتا پیاوی شەڕکەر رویان لەکۆشکی فرتنا کرد. ئەوان عوسمان کوڕی بشر کوڕی موحتەفیزی مازنیان کردە سەرکردەی خۆیان. ئەم کەسانە هاورێیەتیان دەکرد: شوعبە کوڕی

زوهەیری نەهشەلی، وەرد کوڕی فەلەقی عەنبەری، زوهەیر کوڕی زوەیبی عەدەوی، جیهان کوڕی مەشجیعەی زەببی، حەجاج کوڕی ناشبی عەدەوی، رەقبە کوڕی حوڕ ودەستەیەك لەسوارکاران و نازاکانی ئەوان. کوڕی خازم گەمارۆی خستە سەریان. ئەوان روبەروی دەبونەوە و شەڕیان لەگەڵ دەکرد و دواتر بۆ کۆشکەکە دەگەڕانەوە.

رۆژێك کوڕی خازم لەگەڵ شەش هەزار پیاوی شەڕکەر هاتەدەر و کەسانی ناو کۆشك هاتنەدەر. عوسمان کوڕی بشر بەوانی وت: بگەڕێنەوە چونکە ناتوانن لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکەن. زوهەیر کوڕی زوەیب تەلاقی خوارد کە نەگەڕێتەوە تا ریزەکانی ئەوان بشکێنێت. ئەو لەناو روبارێکی وشك خۆی داشارد. سوپاکەی عەبدالله لەبونی ئەو ئاگادار نەبون کە لەناکاو هێرشی کردە سەریان و دواتر گەڕایەوە و جارێکیتر خۆی ئامادە کردەوە. ئەوان شوێنی کەوتن و بەردەوام بانگیان دەکرد بەڵام کەسیان نەیوێرا بەدوایدا بڕواتە خوار. بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. دوبارە هێرشی کردە سەریان کە رێگەیان بۆ کردەوە تا خۆی پاشەکشێی کرد.

کوڕی خازم بەهاوەڵانی خۆی وت: کاتێك دەتانەوێت بەڕم لەزوهەیر کوڕی زوەیب بدەن، قولاب لەنوکی رمەکانتان بدەن و دواتر لەکەڕەستەی شەڕی ئەوی بچەقێنن. ئەو هات و بەڕم هێرشی کردە سەریان. ئەوان چوار رمیان بەقولابەوە پێ هەڵواسی. گەڕایەوە تا هێرش بکاتە سەریان، دەستیان لەرزی و رمەکانی خۆیان فرێدا. ئەو گەڕایەوە و چوار رمی لەگەڵ خۆیدا هێنا و گەڕایەوە بۆ ناو کۆشکەکە.

عەبدالله کوڕی خازم کەسی بۆ لای زوهەیر کوڕی زوەیب رەوانە کرد و پەیامیدا کە سەد هەزار درەمی پێدەدات لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی میسان تا بۆ خۆی بێت بەو مەرجەی دەست لەشەڕ کردن هەڵبگرێت و چاکەخوازی ئەم بێت. زوهەیر رازی نەبو. کاتێك ئاڵقەی گەمارۆدان لەسەر ئەوان درێژ بویەوە، کەسیان بۆ لای کوڕی خازم رەوانە کرد و داوایان لێکرد دەستبەرداریان ببێت تا بێنەدەر و بڵاوەی لێبکەن. وتی: ئەو کارە ناکەم مەگەر ئەوەی ملکەچی فەرمانەکانی من بن. ئەوان رازی بون: زوهەیر کوڕی زوەیب وتی: دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت، سوێند بەخوا تا دواپین کەس کوشتارتان دەکات. ئەگەر دەتانەوێت، بمرن، بوێرانە و پیاوانە بمرن. هەمومان پێکەوە دەڕۆینەدەر کە یا رێزدارانە دەمرین یا دەستەیەك دەمرێت و دەستەیەك رزگاری دەبێت. سوێند بەخوا

ئەگەر پیاوانە هێرش بکەنەسەر ئەوان، ڕێگەتان بۆ دەکەنەوە. ئەگەر دەتانەوێت من لەپێشەوە هێرش دەکەم و ئەگەر نا بەدوای ئێوەدا. ئەوان رازی نەبون. وتی: ئێستا نیشانتان دەدەم، داستانی جەنگ و پیاوەتی چیە. ئەو و رەقبە کوڕی حوڕ و کۆیلەیەکی تورك نەژاد هێرشێکی قورسیان کردە سەر ئەوان کەخۆیان لادا و ڕێگەیان بۆ کردنەوە. ئەم سیانە شەڕیان کرد و ئازایەتیان لەخۆیان نیشاندا. زوهەیر گەڕایەوە و هاوڕێکانی رزگاریان بو.

کاتێك زوهەیر بۆ لای کەسانی ناو کۆشك گەڕایەوە، وتی: چۆنیەتی شەڕکردنتان بینی، فەرمانەکانی من ئەنجام بدەن. وتیان: ئێمە بۆ ئەم کارە ناتەوانین و هیوامان بەژیان هەیە. وتی: منیش لەمەرگ دەترسم. ئەوان لەسەر فەرمانی عەبدالله کوڕی خازم هاتنەدەر. ئەو چەندین کەسی رەوانە کرد ویەك یەك ئەوانی بەند کرد. ویستی بیانبەخشێت بەڵام کوڕەکەی موسا کوڕی عەبدالله رازی نەبو و وتی: ئەگەر لەوان خۆش ببیت، خۆم دەکوژم. جگە لەسێ کەس هەمویانی کوشت: حەجاج کوڕی ناشب کەیەکێك لەهاوڕێکانی سەبارەت بەو نێوەنجیگەری کرد و کوڕی خازم لەخوێنی خۆش بو، جیهان کوڕی مەشجەعەی زەبیی کەخۆی خستە سەر قاچی محەممەد کوڕی عەبدالله و پێشتر ئاماژەمان پێدا، پیاوێکیتر لەبەنی سەعد لەخەڵکی تەمیم. ئەو هەمان کەس بو لەکاتی هێرشی کردنی جەڵك بۆ سەر کوڕی خازم، ئەوی لەدەست ئەوان رزگار کردبو. کوڕی خازم وتی: بوێری سوارکاری موزەریەکان ئازاد بکەن.

دەڵێن: کاتێك ویستیان زوهەیر کوڕی زوەیب کە بەزنجیر بەسترابویەوە، لەسەر زەوی هەڵبگرن، خۆی بەدور گرت و پشتی بەڕمەکەی خۆی بەست. دواتر بەشەلەشەل و زنجیر لەپێ بەرەو لای عەبدالله کوڕی خازم ڕۆشت و لەبەرابەر ئەو دانیشت. کوڕی خازم پرسی: ئەگەر ئازادت بکەم و شاری میسان بەتۆ ببەخشم، چۆن سوپاسی من دەکەیت؟ زوهەیر وتی: ئەگەر تەنیا لەخوێنی من خۆش ببیت، سوپاست دەکەم. بەڵام کوڕەکەی موسا ڕێگەی نەدا ئازادی بکات. باوکی وتی: هاوار لەتۆ، کەسێکی وەك زوهەیر کوڕی زوەیب بکوژین! کێ لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام شەڕ دەکات؟ کێ پارێزگاری لەژنانی عەرەب دەکات؟ وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەخوێنی براکەمدا ببیتە شەریك، دەتکوژم. کوڕی خازم فەرمانیدا و ئەویان کوشت. زوهەیر کوڕی زوەیب وتی: هیچ نیازێکم نیە، فەرمان

بدەن بەشێوەیەك بمكوژن تا خوێنم لەگەڵ خوێنی ئەم پەستانە تێكەڵ نەبێت، چونكە من ڕێگەی ئەم كارەم لێگرتن و داوام لێكرد بوێرانە و ئازایانە بمرن و وتم بەشمشێر هێرش بكەنە سەرتان و لەناوتان ببەن. سوێند بەخوا ئەگەر ئەو كارەیان دەكرد، ئێوەیان دەتۆقاند و ئەم كوڕەی تۆیان بەخۆیەوە سەرقاڵ دەكرد تا ئەوەی لەبیری تۆڵە سەندنەوەی خوێنی براكەیدا بێت. ئەوان ڕازی نەبون. ئەگەر ئامۆژگاری منیان لەگوێ دەگرت، هیچ پیاوێك لەوان نەدەكوژرا مەگەر ئەوەی چەند كەسێكیان بكوشتایە. كوڕی خازم فەرمانیدا ئەویان بردە سوچێك وسەریان بڕی.

كاتێك هەواڵی كوژرانەكەی بەحەریش گەیشت، وتی:

اعاذل انی لم الم فتالهم　　و قد عض سیفی كبشهم ثم صمما

اعاذل ما ولیت حتی تبددت　　رجال و حتی لم اجد متقدما

اعاذل افنانی السلاح و من یطل　　مقارعة الابطال یرجع مكلما

اعینی ان انزفتما الدمع فاسكبا　　دما لازما لی دون ان تسكبادما

ابعد زهیر و ابن بشر تتابعا　　و ورد ارجی فی خراسان مغنما

اعاذل كم من یوم حرب شهدته　　اكر اذا ما فارس السوء احجما

یانی: ها، ئەی سەركۆنەكەر، من لەشەڕ لەگەڵ ئەوان كەمتەرخەمیم نەكرد تا شمشێرەكەم ناوچاوی ئەوانی بڕی و لەمێشكیان چەقی. ئەی سەركۆنەكەر، من پشتم نەكردە جەنگ تا پیاوانێك لەخاك و خوێندا گەوزان و بۆمن هیچ پێشڕەوێك نەمایەوە. ئەی سەركۆنەكەر، كەرەستەی شەڕ، منی لەناو برد و هەركەس ڕوبەڕوی شەڕكەران ببێتەوە و لەوان بدات و لێی بدەن، بریندار دەگەڕێتەوە. ئەی دو چاوی من، ئەگەر دەتانەوێت فرمێسك ببارێنن، پێش ئەم كارە خوێنن ببارێنن و مەوەستن. ئایا دوای بشر و زوهەیر كە هەردوكیان لەدوای یەك لەناوچون و دوای وەرد، هیوامان بەمباش بونی خوراسان هەبێت؟ ئەی سەركۆنەكەر، زۆرن ئەو شەڕانەی تیایاندا بەشداربوم و بەردەوام پێشڕەویم دەكرد و ئەمە لەكاتێكدا بو سوارە ترسنۆكەكان هەڵدەهاتن.

مەبەستی زوهەیر كوڕی زەوییب و عوسمان كوڕی بشر و وەرد كوڕی فەلەق بو.

## ڕەوانە بونی کوڕی ئەشتەر بۆ شەڕی کوڕی زیاد

لەم ساڵەدا، هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی زی حەجحە/، ١٩ ژوئیەی ٦٨٦ زایینی، ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر بۆ شەڕ لەگەڵ کوڕی زیاد بەرێکەوت. بەرێکەوتنی ئەو دو ڕۆژ دوای تەواو بونی موختار لەشەڕی سەبیع بو. موختار سوارەکان و گەورەکان و ڕۆشنبیرەکان و خاوەن ئەزمونەکانی سوپاکەی خۆی لەگەڵ ئەودا ڕەوانە کرد. موختار خۆی بەرێیکرد. کاتێك گەیشتنە نشینگەی عەبدولرەحمان کوڕی دایکی حەکەم، یارانی موختار ئەویان بینی و ئەوان تەختێکیان پێبو کە ئێسترێکی خۆڵەمێشی هەڵیدەگرت. ئەوان لەخوا دەپاڕانەوە و هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخواست. پاسەوانی تەختەکە، حەوشبی ئەلبەرسمی بو. کاتێك موختار ئەوانی بینی، وتی:

اما ورب المرسلات عرفا لنقتلن بعد صف صفا

و بعد الف قاسطين الفا

یانی: سوێند بەنێردراوە یەك لەدوای یەکەکان، کوشتارتان دەکەین ریز بەریز، دوای هەردەستەیەك لەستەمکاران، هەزاران ستەمکاریتر.

دواتر موختارماڵئاوایی لێکرد و فەرمانی پێدا: سێ ئامۆژگاری من لەگوێ بگرە: لەخوای گەورە خۆت بەدور بگرە چ بەنهێنی وچ بەئاشکرا، لەهێرش کردنە سەر دوژمن پەلە بکە و کاتێك چاوت بەدوژمنەکانت کەوت، هەمان کات شەڕیان لەگەڵ دەست پێبکە تا پەرێشان ببن.

موختار گەڕایەوە و ئیبراهیم بەرێکەوت و گەشتەی لای ئەو کەسانەی تەختەکەیان هەڵگرتبو. ئەوان دەوریان گرتبو. دەستەکانی خۆیان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و بەردەوام لەخوا دەپاڕانەوە. ئیبراهیم وتی: ئەی خوایە، بۆ ئەو کارەی نەزانەکانمان دەیکەن، لەئێمە خۆش ببە. ئەمە شێوازی کرداری ئیسرائیلیەکانە. سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەو دایە، ئەمە هەمان گوێرەکەیە کە ئەوان بەدەوریدا دەسوڕانەوە. ئەوان بەدوای کاری خۆیاندا ڕۆشتن و ئەم بەدوای کاری خۆی.

## داستانی ئەو تەختەی موختار داوای هاوکاری لێدەکرد

توفەیل کوڕی جوعدە کوڕی هوبەیرە دەڵێت: جارێك گیرۆدەی گرفتاریەکی دژوار بوین. ڕۆژێك لەرۆژەکان ڕۆشتینەدەر و بینیمان دراوسێ ڕۆن فرۆشەکەمان تەختێکی هەیە کە بەچڵك وپیسی داپۆشراوە. بەخۆم وت: خۆزگە سەبارەت بەم تەختە قسەم لەگەڵ موختار دەکرد. لەرۆن فرۆشەکەم وەرگرت و شۆردم و داری تەڕوتازە دەرکەوت کەدەدرەوشایەوە و ڕۆنی لێ دەباری. بەموختارم وت: شتێکم ئامادە کردوە و دەمەوێت لەگەڵ تۆ باسی بکەم: ئەبوجەعدە لەناو ئێمە لەسەر تەختێك دادەنیشت و دەیوت نیشانەیەکی عەلی تیایە. موختار وتی: پەنا بەرخوا، تا ئێستا منت لەمە ئاگادار نەکردۆتەوە! بیهێنە بۆ من. بردم. سەرتەختەکەیان بەپارچەیەکی زۆر جوان داپۆشیبو. فەرمانیدا کە دوانزە هەزار درەمیان بەمن بەخشی. دواتر هاواری کرد: نوێژی گشتیە. خەڵك کۆبونەوە و موختار وتی:

هەمو ئەو شتانەی لەناو ئۆمەتەکانی پێشوبوە، لەناو ئەم ئۆمەتەیشدا بەشێوەیەك دەردەکەوێت. لەناو ئیسرائیلیەکان تابوت بوە و ئەم تەختە بۆ ئێمە هاوشێوەی ئەو تابوتەیە. خەڵك لەدەوری ئەو بلاوبونەوە. سەبەئیەکان هەستان وتەکبیریان وت.

زۆری نەخایاند موختار سوپاکەی خۆی بۆ شەڕی کوڕی زیاد ڕەوانە کرد. تەختەکەیان بەپارچەی زۆر گرانبایی و جوان داپۆشیبو و خستیانە سەر ئێسترێك. خەڵکانی شام بەسەختی کوشتار کران. ئەم کارە بوە هۆی سەرسوڕمان و پەرێشانی زیاتری ئەوان. ئەوەندە بەرزیان کردەوە وەك بڵێی بتپەرەست بون. من لەوەی کردبوم، پەشیمان بوم و خەڵك سەبارەت بەم کارە قسەیان دەکرد و ڕەخنەیان لەموختار دەگرت.

دەستەیەك دەڵێن: موختار بەبنەماڵەی جەعدە کوڕی هوبەیرەی وت (و دایکی جەعدە دایکی هانی خوشکی دایك و باوکی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بو): بێ گومان ئێوە نەزانن. بڕۆن و تەختەکە بۆ من بێنن. ئەوان گومانیان کرد هەر تەختێك بەرن، دەڵێت خۆیەتی و لێیان وەردەگرێت. تەختێکیان بۆ هێنا و لێی وەرگرتن. شێبامیەکان وشاکریەکان و سەرانی سوپاکەی موختار بەپەڕ دایانپۆشی. یەکەم کەس پاسەوانی کردنی گرتەئەستۆ، موسا کوڕی ئەبو موسا ئەشعەری بو. ئەو بەدەوی تەختەکە دەسوڕایەوە چونکە دایکی، دایکی کولسوم کچی فەزل کوڕی عەباس بو. خەڵك ڕەخنەیان لەئەبوموسا گرت و

سەرکۆنەیان کرد. ئەو وازی هێنا و حەوەشب ئەلبەرسمی پاسەوانی دەکرد تا موختار لەناوچو. ئەعشی هەمەدانی لەمبارەوە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| شهدت عليكم انكم سبئية | و اني بكم يا شرطة الشر عارف |
| فاقسم ما كرسيكم بسكينة | و ان كان قد لفت عليه اللفائف |
| و ان ليس كالتابوت فينا و ان سعت | شبام حواليه و نهد و خارف |
| و انى امرؤ احببت ال محمد | و تابعت و حيا ضمنته المصاحف |
| و بايعت عقبداللة لما تتابعت | عليه قريش شمطها و الغطارف |

یانی: شایەتی دەدەم هەموتان لەسەبەئیەکانن و من لەگەڵ ئێوە ئاشنام. سوێند دەخۆم تەختەکەی ئێوە تەخت نیە هەرچەندە بەپارچە داتانپۆشیبێت. ئەم تەختە بۆ ئێمە هاوشێوەی تابوتی ئیسرائیلیەکان نیە هەرچەند خەڵکی شێبام و نەهد و خارف بەدەوریدا بسورێنەوە. من ئەو پیاوەم کە بنەماڵەی محەممەدم خۆش دەوێت، شوێنکەوتەی وەحی خواییم، ئەو وەحیەی گەلاَکان دایانپۆشی. لەگەڵ عەبداللە ئەو کاتە بەیعەتم کرد کە لەقورەیشیەکان، هەمو ریش سپیەکان و گەنجەکانیان پەیوەستی ببون.

متوەکلی لەیسی وتی:

| | |
|---|---|
| ابلغ ابا اسحاق ان جئته | انى بكَرسيكم كافر |
| تروا شباما حول اعواده | و تحمل الوحى له شاكر |
| محمرة اعينهم حوله | كانهن الحمص الحادر |

یانی: ئەگەر ڕۆشتیتە لای باوکی ئیسحاق، لەمنەوە ئاگاداری بکەرەوە کە بەتەختەکەی ئێوە ناباوەڕم. شێبامیەکان دەبینی کە بەدەوریدا دەسورێنەوە و وەحیە خواییەکەی شاکریەکان هەڵیدەگرنەوە. چاویان سورە و لەدەوری ئەون وەك بڵێی رشتەکان لەدانەی گیا سورباوەکان و زەموڕد رەنگەکانن.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

فەرمانداری شارەکان ئەمانە بون: مەصعەب کوڕی زوبەیر لەلایەن براکەی عەبدالله ، فەرمانداری بەسرە، عەبدالله کوڕی ئەبی رەبیعەی مەخزومی کارگوزاری کوڕی زوبەیر، موختار کوڕی ئەبی عوبەیدەی سەقەفی فەرمانڕەوای کوفە، عەبدالله کوڕی خازم لەخوراسان.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: ئەسما کوڕی حارسەی ئەسلەمی لەهاوەڵانی پێغەمبەر کە لەدانیشتوانی (صفە) بو و دەستەیەك دەڵێن: لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی کوڕی زیاد لەبەسرە لەم شارە مرد. جابر کوڕی سەمورە خوشکەزای سەعد کوڕی وەقاص کەدەستەیەك دەڵێن: لەرۆژگاری فەرمانداری بشر کوڕی هارون مرد. ئەسما کوڕی خارجە کوڕی حصن کوڕی حوزەیفە کوڕی بەدری فەزاری سەروەری خەڵکەکەی خۆی.

## روداوەکانی ساڵی شەست و حەوتی کۆچی ( ٦٨٦-٦٨٧ زایینی )

### کوژرانی کوڕی زیاد

کاتێك ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری نەخەعی لەکوفەوە بەرێکەوت، لەگەڵ سوپاکەی لەرۆشتن پەلەیان کرد تا پێش گەیشتنی کوڕی زیاد بەعێراق روبەروی ببنەوە. کوڕی زیاد بەسوپایەکی گەورەوە لەشام بەرێکەوتبو. سەرەتا وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، گەیشتە موسڵ و دەستی بەسەرداگرت. ئیبراهیم بەرێکەوت و سەرزەمینی عێراقی بڕی و بەجێیهێشت و لەسەراسەری موسڵ تۆوی ترس و تۆقاندنی چاند. فەرماندەیی پێشەنگەکانی خۆی بە توفەیل کوڕی لەقیتی نەخەعیدا کەپیاوێکی ئازا و بوێر بو. کاتێك کوڕی زیاد لێی نزیك کەوتەوە، هاورێکانی خۆی بۆ شەر ئامادە کرد و بەیەکپارچەیی و دور لەبەربڵاوی هەنگاوی بۆ پێشەوە دەبرد جگە لەوەی توفەیل کوڕی لەقیتی وەك فەرماندەی پێشەنگەکان رەوانە کرد تا گەشتنە روباری خارز لەسەرزەمینی موسڵ و لەگوندی بارشیا دابەزی. کوڕی زیاد روی تێکرد تا لەنزیك ئەو لەکەنارەکانی خارز ئوردوی لێدا.

عومەیر کوڕی حەبابی سولەمی، لەیارانی زیاد، کەسی بۆ لای کوڕی ئەشتەر رەوانە کرد کە چاوت بەمن بکەوێت. قەیسیەکان هەمویان لەشەڕی مەرج راهیت بەم لاوە، لەعەبدولەلیك کوڕی مەروان تورە بون و سوپاکەی ئەو لەخەڵکانی کەلب بو. عومەیر و کوڕی ئەشتەر کۆبونەوە و عومەیر ئاگاداری کردەوە کە خۆی فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی کوڕی زیادە. مژدەی پێدا کاتێك ئاگری شەڕ بڵێسە بسەنێت، لەگەڵ هاورێکانی خۆی هەڵدێت و بەمشێوەیە شکانی سوپاکەی کوڕی زیاد ئاشکرا دەکات. کوڕی ئەشتەر لێی پرسی: گومان دەکەیت دەبێت چی بکەین؟ سەنگەر بۆ خۆم دروست بکەم و دو سێ رۆژ چاوەرێ بکەم؟ عومەیر وتی: ئەم کارە مەکە. مەگەر ئەوان جگە لەمەیان دەوێت؟ درێژبونەوەی کات بۆ ئەوان باشترە. ئەوان لەژمارەدا فراوان و چەندین بەرابەری ئێوەن. سوپاکەمەکەی ئێوە لەبەرابەر ئەو سوپا گەورەیە ناتوانێت خۆڕاگری بکات. لەجیاتی ئەم کارە لەناکاو هێرش بکەرەسەریان و شەڕ دەست پێبکە. ئەوان لێوانلێون لەترسی ئێوە. ئەگەر ئەوان یارانی تۆ هەڵسەنگێنن و بۆچەندین رۆژی بەردەوام شەڕیان لەگەڵ بکەن،

عادەت بەم کارە دەگرن و دەتوانن بەسەر ئێوەدا سەرکەون. ئیبراهیم وتی: ئێستاکە زانیم کەتۆ چاکەخوازی منیت چونکە سەروەرم ئەم فەرمانەی پێدام. عومەیر وتی: فەرمانەکەی بەکار ببە چونکە جەنگ، ئەم پیرە بیرمەندەی بەئەزمون کردوە. ئەو، ئەوەندەی رەنج لەکاروباری جەنگ بردوە کە هیچ کەسێکیتر ئەو ئەزمونەی نیە. کاتێك بەیانی داهات، شەڕی ئەوان دەسپێبکە.

عومەیر بۆ لای هاورێکانی خۆی گەڕایەوە و ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر کەسانی خۆی بۆ پاسەوانی کردنی وشیارانە راسپارد. ئەو خۆی نەخەوت تا بەرەبەیان گەیشت، سوپاکەی خۆی بۆ شەڕ رێکخست و دەستە شەڕکەرەکانی لەشوێنەکانی خۆیان جێگیر کرد و فەرماندەکانی دەست نیشان کرد. سوفیان کوڕی یەزیدی ئەزدی کردە فەرماندەی باڵی راست، عەلی کوڕی مالکی جوشەمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ، عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله (برای ئیبراهیمی ئەشتەر لەدایکەوە) کردە فەرماندەی سوارەکان کە کەم بون و توفەیل کوڕی لەقیتی کردە فەرماندەی پیادەکان.

کاتێك بەرەبەیان گەیشت، نوێژی بەیانیان لەتاریکیدا خوێند. دواتر هاتەدەر و سوپاکەی خۆی ریزبەندی کرد و هەر فەرماندەیەکی لەشوێنەکەیدا جێگیر کرد. ئیبراهیم دابەزی لەناو سوپاکەی خۆی دەستی بەگەڕان کرد و ئەوانی بۆ شەڕ هان دەدا و هیوای سەرکەوتنی لەدڵی ئەواندا دەچاند و ئارام ئارام بۆ روبەروبونەوەی دوژمن پاڵی پێوەنان. دواتر رۆشتە سەر تەپۆڵکەیەکی گەورە کە لەخوارەوە دوژمنەکانی خۆی لەبەرچاو بو. بینی لەو خەڵکە کەس لەشوێنەکەی خۆی نەجولاوە. عەبدالله کوڕی زوهەیری سەلولی رەوانە کرد تا لەبارودۆخی دوژمن ئاگاداری بکاتەوە. ئەو گەڕایەوە و وتی: ئەوان لەگەڵ ترس و پەرێشانیدا بەسەر دەبەن. پیاوێك لەوان منی بینی و بەردەوام دەیوت: ئەی شیعەکانی ئەبو توراب! ئەی شیعەکانی موختاری درۆزن! پێم وت: ئەوەی لەنێوان ئێمەدایە، زۆر لەجوێن گەورەترە.

ئیبراهیم سوار بو و بەناو ئاڵادارەکاندا گەڕا و ئەوانی بۆ شەڕ ئامادە و تەیار کرد و بنەماڵەی حسین کوڕی عەلی بیرخستنەوە کە کوڕی زیاد ئەوانی لەئاگری جەنگ و کوشتار و ئەسیری و تینویەتی گرفتار کرد. خەڵکی بۆ شەڕ دژی سوپای شامیەکان هەڵخراند.

خەڵك پێشڕەویان کرد. کوڕی زیاد حوصەین کوڕی نەمیری کردە فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی خۆی و عومەیر کوڕی حوبابی سولەمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ، شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاعی حەمیری کردە فەرماندەی سوارەکان. کاتێك دو ریزەکە بەیەك گەیشتن، حوصەین کوڕی نەمیر لەگەڵ شەڕکەرانی باڵی راستی سوپاکەی کوڕی زیاد هێرشیان دەست پێکرد. عەلی کوڕی مالکی جوشەمی خۆڕاگری کرد و کوژرا. دواتر قورە کوڕی عەلی ئاڵاکەی هەڵگرت و هاورێ لەگەڵ شەڕکەرە ئازاکان کوژرا و باڵی چەپ شکستی خوارد. عەبدالله کوڕی وەرقا جونادەی سەلولی، برازای حوبشی کوڕی جونادە هاورێی پێغەمبەر، ئاڵاکەی هەڵگرت و هەڵاتوان رویان لەگۆڕەپانی شەڕ کردەوە. هاواری کرد: ئەی پارێزەرانی خوا، لەدەوری من کۆببنەوە. ئەوان گەڕانەوە و ئیبراهیم سەری روت کردبو و هاواری دەکرد: ئەی پارێزەرانی خوا، لەدەوری من کۆببنەوە، من کوڕی ئەشتەرم، باشترین هەڵاتوانی ئێوە هێرشبەرانن، ئەو کەسەی سەرکۆنە لەخۆی بسرێتەوە، خراپەکار نیە. هاورێکاتی گەڕانەوە و شەڕکەرانی باڵی راستی سوپاکەی ئیبراهیم هێرشیان کردە سەر باڵی چەپ و هیوادار بون عومەیر کوڕی حوباب( لەسەر بنەمای بەڵێنەکەی خۆی) رابکات. عومەیر هەڵاتنی بەشەرم ونەنگ زانی و لەبەر ئەمە بەسەختی درێژەی بەشەڕدا. کاتێك ئیبراهیمی ئەمەی بینی، بەهاورێیانی خۆی وت: روبکەنە ئەو کۆمەڵە ڕەشە گەورەیە چونکە سوێند بەخوا ئەگەر ئەوان شکەست بدەین، ئەوانەی دەیانبینن، وەك باڵندەکان، ترساو بەم لاولادا رادەکەن. هاورێکانی رویان کردە ئەو شوێنە و بەرم کەوتنە گیانی یەك. دواتر دەستیان بۆ شمشێر و گورزەکان برد وماوەیەك جەنگان. دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان هاوشێوەی دەنگی دارخەیزەران بۆ ئاسمان بەرزبویەوە. ئیبراهیم بە ئاڵادارەکەی خۆی وت: ئاڵاکە خۆت لەناو ئەوان بۆ پێشەوە بەرە. ئاڵادار وەڵامی دایەوە: هیچ رێگەیەك بۆ پێشڕەوی نیە. ئیبراهیم بەردەوام دەیوت: هەیە، هەیە. کاتێك بۆ پێشەوە دەڕۆیشت، ئیبراهیم بەشمشێرەکەی خۆی هێرشی دەکردە سەریان و لەهەر کەسی دەدا، دەیخستە سەرزەوی. ئیبراهیم پیادەکانی لەبەردەم خۆی پاك دەکردەوە وەك بڵێی رانەمەرێکن کەگورگ کەوتبێتە ناویان. هاورێکانی هاوشێوەی یەك کەس هێرشیان برد. شەڕ روی لەدژواری کرد و سوپاکەی کوڕی زیاد شکەستی خوارد و لەهەردولا کەسانێکی فراوان کوژران و لەخاك و خوێندا گەوزان.

دەستەیەك دەڵێن: عومەیر کوڕی حەباب یەکەم کەس بو هەڵات و شەرکردنی ئەو لەسەرمتاوە تەنیا بەلگەیەك بو.

کاتێك شکستیان خوارد، ئیبراهیم وتی: من پیاوێکم لەژێر ئاڵایەك بەتاقی تەنیا لەکەنارەکانی خارز کوشت. بیدۆزنەوە چونکە بۆنێکی خۆشی لێدەهات. دەستی روی لەرۆژهەڵات و قاچەکانی رویان لەرۆژئاوا. بەدوایدا گەڕان و بینیان کوڕی زیادە کە لەزەربەکەی ئیبراهیم کوژراوە. کەوتبوە سەرزەوی. ئیبراهیم ئەوی کردبوە بەدوکەرت.

بەهەمان شێوە بو کە ئیبراهیم ئاماژەی پێدا. سەریان بڕی و جەستەکەیان سوتاند.

شەریك کوڕی جەدیری تەغلەبی هێرشی کردە سەر حوصەین کوڕی نەمیر چونکە ئەوی بەعوبەیدالله دەزانی. ئەم دوانە پەلاماری یەکیاندا و شەریك کوڕی جەدیر هاواری کرد: من لەگەڵ ئەم روسپی زادە بکوژن! ئەوان حوصەینیان کوشت.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی کوڕی زیادی کوشت، شەریك کوڕی جەدیر بو. شەریك لەشەڕی صەفین شان بەشانی عەلی شەڕی کرد و یەکێك لەدوچاوەکەی خۆی لەدەستدابو. کاتێك رۆژگاری عەلی بەسەرچو، شەریك ڕۆشتە شاری بیت المقدس و لەوێ نیشتەجێ بو. کاتێك حسین کوژرا، لەگەڵ خوا پەیمانی بەست ئەگەر کەسێك داوای تۆڵەی خوێنی حسین بکات، پەیوەستی ببێت و کوڕی زیاد بکوژێت یا لەم ڕێگادا بکوژرێت. کاتێك موختار بۆتۆڵە سەندنەوەی خوێنی حسین بزوتنەوەکەی خۆی دەست پێکرد، پەیوەستی بو و لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری نەخەعی بەرێکەوت. کاتێك دو سوپا روبەروی یەك بونەوە، هێرشی کردە سەر سوارەکانی شام و هاورێ لەگەڵ خەڵکەکەی لەرەبیعە ریزەکانی ئەوان تێکشکاند. ئەوان گەیشتنە کوڕی زیاد. تەپ و تۆز بۆ ئاسمان بەرزبویەوە و جگە لەدەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان هیچ دەنگێك نەدەبیسترا. بای گۆڕەپان دامرکایەوە و بینیان هەردوکیان کوژراون؛ شەریك و کوڕی زیاد. گێڕانەوەی یەکەم راستترە.

ئەوە کە وتبوی:

كل عيش قد اراه باطلا      غير ركز الرمح فى ظل الفرس

یانی: هەمو شێوەکانی ژیان بەهیچ دەزانم جگە لەدەنگی لێدانی ڕم لەسێبەری سەمەندە تیژپێکان.

دەڵێت: شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاعی حەمیریش کوژرا و سوفیان کوڕی یەزیدی ئەزدی و وەرقا کوڕی عازبی ئەسەدی و عوبەیدالله کوڕی زوهەیری سولەمی هەرکام وتیان من بکوژی ئەوم. عوبەیینە کوڕی ئەسما لەگەڵ کوڕی زیاد بو. کاتێك کوڕی زیاد کوژرا، ئەو خوشکەکەی خۆی هند کچی ئەسما ژنی عوبەیدالله‌ی هەڵگرت و بەردەوام ئەم هۆنراوە جەنگیەی دەخوێند:

ان تصرمی حبالنا فربما          اردیت فی الهیجا الكلمی المعلما

یانی: ئەگەر پەیوەندیەکان بپچڕێنیت، زۆر ئازای ناودارم لەخاك و خوێندا گەوزاند.

کاتێك سوپاکەی کوڕی زیاد شکستی خوارد و هەڵاتن، ئەو کەسانەی لەئاودا خنکان، زیاتر لەو کەسانە بون کە لەگۆڕەپانی شەڕ کوژران.

ئیبراهیم ئەو کاتەی لەمەداین بو، مژدەی سەرکەوتنی بۆ موختار رەوانە کرد. ئەو کارگوزارانی خۆی بۆشارەکان رەوانە کرد. براکەی خۆی لەدایکەوە، عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله‌ی وەك فەرمانداری نەصیبین دەستنیشان کرد. دەستی بەسەر دارا، سەنجار و سەرزەمینەکانی دەوروبەریدا گرت. ئەم کەسانەی کردە فەرمانداری شارەکان: زەفەر کوڕی حارس وەك فەرمانداری قرقیسیا، حاتەم کوڕی نەعمانی باهلی کردە فەرمانداری حەڕان و رەها و سومەیسات و ناوچەکانی پەیوەست بەم سەرزەمینانە، عومەیر کوڕی حوبابی سولەمی کردە فەرمانداری توری عەبدین و کەفەرتوسا.

ئیبراهیم لەموسڵ مایەوە. سەری عوبەیدالله کوڕی زیادی هاورێ لەگەڵ سەری فەرماندەکانیتر بۆ موختار رەوانە کرد کە لەسوچێکی کۆشکەکەی فرێیدان. تولە مارێك هات و رۆشتە ناو دەمی کوڕی زیاد ودواتر لەقوڕگی بڕاوی ئەو هاتەدەر. چەندین جار ئەم کارەی دوبارە کردەوە. تەرموزی ئەم گێڕانەوەی لەکتێبی (جامع) باس کردوە.

موغەیرە وتی: کوڕی زیاد یەکەم کەس لەئیسلام بو دەرمی تایبەتی لێدا. یەکێك لەدەرگاوانەکانی کوڕی زیاد وتی: کاتێك حسین کوژرا، لەگەڵ ئەو ڕۆشتمە ناو کۆشکەکەی. ئاگرێك داباری و روخساری داگرت. ئەو روخساری بەدەستی داپۆشی و وتی: ئەم نهێنیە بەکەس مەڵێ.

موغەیرە دەڵێت: دوای کوژرانی حسین، مەرجانە بە عوبەیدالله‌ی کوڕی وت: ئەی گڵاوی خراپەکار، کوڕی کچی پێغەمبەرت کوشت، هیچ کات بەهەشت نابینیت.

کاتێك کوڕی زیاد کوژرا، کوڕی مەفرەغ وتی:

ان المنايا اذ مازرن طاغية — هتكن استار حجاب و ابواب

اقول بعدا و سحقا عند مصرعه — لابن الخبيثة و ابن الكودن الكابى

لا انت زوحمت عن ملك فتمنعه — و لا متت الى قوم باسباب

لا من نزار و لا من جذم ذى يمن — جلمود ذا القيت من بين الهاب

لا تقبل الارض موتاهم اذا قبروا — و كيف تقبل رجسا بين اثواب

یانی: کاتێك مەرگ هێرش دەکاتە سەر یاخیەك، پەردەکان دەدرێنێت و دەرگاوانەکان دور دەخاتەوە. لەکاتی کوژرانی ئەو وتم: دور بێت کوڕی ئەو ژنە خراپەکارە، زادەی ئەو و ئەو هەڵاتوە لە بانگەوازە چاکەکان! ئەوڵاتێکی دژی تۆ هاندابو کە بتەوێت پارێزگاری لێ بکەیت ونەپەیوەندیت لەگەڵ کەسە خاوەن نەژادەکان هەبو. نە لەنزار بویت، نە لەجەزم نە لەیەمەن، ئەم بەردە لەشوێنی راستیدا فرێنەدرایە ناو بڵێسەکانی ئاگر. کاتێك بمرن، گۆڕەکان بەمردوەکانیان رازی نابن، چۆن بەلاشەیەکی کفن کراو رازی ببن!

هەروەها سوراقەی بارقی بۆ وەسف کردنی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر وتی:

اتاكم غلام من عرانين مذحج — جرى على الاعداء غير نكول

فيا ابن زياد بو باعظم مالك — و ذق حد ماضى الشفرتين صقيل

جزى الله خيرا شرطة الله انهم — شفوا من عبيدالله امس غليلى

یانی: گەنجێك لەگەورەزاکانی مەزحەج هێرشی کردە سەر ئێوە کە هێرش دەکاتە سەر دوژمن و پشت ناکاتە هیچ دوژمنێك و لەکاروباری جەنگ کەمتەرخەمی ناکات. ئەی کوڕی زیاد، بەقورسترین باری گوناح برۆ جەهەننەم و لەدو لێواری شمشێر شەرابی مەرگ بچێژە. خوا پاسەوانانی یەزدان باشترن پاداشت ببەخشێت چونکە ئەوان بون داغی دڵی منیان ئارام کردەوە و دادیان لەدوژمن وەرگرت و گیانی گڕگرتوی منیان هێور کردەوە.

عومەیر کوڕی حوبابی سولەمی سەبارەت بەسەرکۆنە کردنی کوڕی زیاد وتی:

و ما كان جيش يجمع الخمر و الزنا — محلا اذ لاقى العدو لينصرا

یانی: هەرگیز ڕەوا نەبو سوپایەك بەفەرماندە و شەڕکەرە شەراب خۆرەکان و پیاوانی مێباز، لەکاتی روبەروبونەوەی دوژمن بەسەر ئەودا زاڵببن.

## فەرمانداری مەصعەب کوڕی زوبەیر لەبەسرە

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی زوبەیر، حارس کوڕی ئەبی رەبیعە ناسراو بە قوباعی لەبەسرە لەسەر کار لابرد و براکەی خۆی مەصعەبی وەك فەرماندار دەستنیشان کرد. مەصعەب بە دەمامك لەروخسار ڕۆشتە ناو بەسرە و دواتر مزگەوت و ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان. خەڵك وتیان: فەرماندار، فەرماندار! حارس کوڕی ئەبی رەبیعەی فەرماندار هات. مەصعەب دەمامکی لەروخسار هەڵگرت و خەڵك ئەویان ناسیەوە. مەصعەب فەرمانی بەحارسدا لەگەڵ ئەو لەسەر تەختی وتاردان دانیشێت و یەك پلە خوارتر لەمەصعەب دانیشت. مەصعەب هەستا و سوپاسی خوای کرد و دواتر وتی:

بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان. ط. س. م. ئەمانە نیشانە ئاشکراکانی نوسراوێکی ئاشکراکەرە. ئێمە بەسەرهاتی فیرعەون و موسا بەراستی و دروستی بۆ تۆ دەخوێنینەوە تا بۆ خەڵکانی خواپەرەستی باس بکەیت. فیرعەون لەسەر زەوی یاخی گەری کردە پیشە و خەڵکی کردە کۆیلەی خۆی، کوڕەکانی ئەوانی بەسەختی و بەشێوازی جۆراجۆر سەردەبڕی و ژنەکانیان زیندو دەمانەوە و ئەو خراپترینی ستەمکاران بو (لێرەدا بەدەست ئاماژەی بەخەڵکی شام کرد) (دەمانەوێت بەخشینەکانی خۆمان بە هەژارەکانی سەر زەوی بدەین و ئەوان بکەینە رێبەران و میرات هەڵگرانی میراتیەکانی جیهان (لێرەدا بەدەست ئاماژەی بەحیجازدا) و زەوی بۆ ئەوان دەستەمۆ بکەین و بەفیرعەون و هامان و سوپاکەیان ئەوە نیشان بدەین کە دەیانترسێنێت (لێرەدا بەدەست ئاماژەی بۆ کوفە کرد) (قصص/ ٢٨/ ١-٦) دواتر وتی: ئەی خەڵکانی بەسرە، بیستومە ئێوە ناوو ناتۆرە لەفەرمانداڕەکانی خۆتان دەنێن. من خۆم ناو ناوە (روگرژی خوێنخۆر).

## بەرێکەوتنی مەصعەب کوڕی زوبەیرو بۆ شەڕ لەگەڵ موختارو کوژرانی موختار

کاتێك گەورەکان وسەرومرانی کوفە بەدوای شەڕی سەبیع هەلاتن، دەستەیەك لەوان ڕۆشتنە لای مەصعەب. شەبس کوڕی ڕێبعی سوار وشترێك بو، کلکی بڕی و گوێچکەی کون کرد و یەخەی جلەکانی خۆی دڕاند و ڕوی کردە دەرگای مەصعەب و بەردەوام هاواری دەکرد: جەنگ! ئەم هەواڵەیان بەمەصعەب گەیاند. وتی: ئەوە شەبس ڕێبعی! ئەویان بردە لای. گەورەکانی کوفە ڕۆشتنە لای و ئاگاداریان کردەوە بۆچی لەکۆشکەکەی ئەو کۆبونەتەوە. داوای هاوکاریان لێکرد و وتیان دەبێت ئێمە بۆ شەڕی موختار ڕەوانە بکەیت.

محەممەد کوڕی ئەشعەسیش هات و بۆ ئەم کارە هانیدا. مەصعەب ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و ڕێزی لێگرت و کاتێك گەورەکانی کوفە لەسەر مەبەستەکەی خۆی پێداگریان کرد، وتی: ڕەوانە نابم تا موهەلیب کوڕی ئەبی صوفرە بێتە لای من. بۆ موهەلیب کە فەرمانداری پارس بو، نامەیەکی نوسی و بانگی کرد تا لەشەڕی موختار هاوڕێیەتی بکات. موهەلیب سستی و کەمتەرخەمی کرد و باجی کردە بیانو چونکە نەیدەویست بۆ شەڕی موختار بڕوات. مەصعەب بەمحەممەد کوڕی ئەشعەسی وت بڕواتە لای موهەلیب وبۆ شەڕ دژی موختار هانی بدات. محەممەد ڕۆشت و نامەکەی مەصعەبی لەگەڵ خۆی برد. کاتێك نامەکەی خوێندەوە وتی: ئایا مەصعەب جگە لەتۆ کەسی دەست نەکەوت ڕەوانەی بکات؟ محەممەد وتی: پەیك نیم، بەلام کۆیلەکانی ئێمە دەستیان بەسەر سامان وژن و بارەگا و منالەکانی ئێمەدا گرتوە.

موهەلیب لەگەڵ سامانێکی فراوان و سوپایەکی گەورە ڕوی لەبەسرە کرد. مەصعەب فەرمانیدا سوپاکە لەشوێنی (میهن پل) (پردی نیشتمان) ئوردویان لێدا. عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف ڕەوانەی کوفە کرد و فەرمانی پێدا تا دەتوانێت خەلك بکاتە هاوڕێی خۆی ولەهاوکاری کردنی موختار دوریان بخاتەوە وپێشنیاری فەرمانبەری کوڕی زوبەیریان پێ بکات. ئەم کارەی کرد و بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتە مالەکەی خۆی. مەصعەب بەرێکەوت و لەپێش خۆیەوە عەباس کوڕی حوصەینی حەتەمی ڕەوانە کرد.

ئەم کەسانەی کردە فەرماندەی بەشە جۆراوجۆرەکانی سوپاکەی: عومەر کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەعمەری کردە فەرماندەی باڵی ڕاست، موهەلیبی کردە فەرماندەی باڵی چەپ، مالك کوڕی مێسمەعی کردە فەرماندەی خەڵکانی بەکر، مالك کوڕی مونزەری کردە فەرماندەی خەڵکانی قەیس، ئەحنەف کوڕی قەیسی کردە فەرماندەی تەمیمیەکان، زیاد کوڕی عومەری عەتکی کردە فەرماندەی ئەزدیەکان و قەیس کوڕی هەیسەمی کردە فەرماندەی خەڵکانی عالیە.

هەواڵی ئەم کارەیان بەموختاردا. ئەو لەناو یارانی خۆی هەستا و لەم ڕوداوە ئاگاداری کردنەوە و فەرمانی پێدان لەگەڵ ئەحمەر کوڕی شەمیت بەرێکەون. ئەو هاتەدەرو لەگەرماوی سەرچاوەکان ئوردوی لێدا. موختار سەرپەرەستی گەرمەکەکانی بانگ کرد. ئەوان پێشتر لەگەڵ ئیبراهیمی ئەشتەر بون. ئەوانی لەگەڵ ئەحمەر کوڕی شەمیت ڕەوانە کرد. بەرێکەوتن و فەرماندەی پێشەنگەکان کوڕی کاملی شاکری بو. گەیشتنە مەزار. مەصعەب دابەزی و لەنزیك ئەوانەوە ئوردوی لێدا. هەر کام سوپاکەی خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد و دواتر پێشڕەویان دەسپێکرد. کوڕی شەمیت ئەم کەسانەی کردە فەرماندە: کوڕی کاملی کردە فەرماندەی باڵی ڕاست، عەبداللە کوڕی وەهەیبی جوشەمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ و ئەبو عەمری خەڵکی عورەینەی کردە فەرماندەی موالیەکان.

عەبداللە کوڕی وەهەیبی جوشەمی ڕۆشتە لای کوڕی شەمیت و پێی وت: موالیەکان و کۆیلەکان لەکارە دژوارەکان خەڵکانێکی لاوازن، هاوڕێ لەگەڵ ئەوان پیاوانێکی زۆر سوارکارانن. تۆ بەرێدەکەویت، فەرمانیان پێبدە لەگەڵ تۆ بەرێکەون چونکە دەترسم بەتەنیا جێت بهێڵن و تەسلیمی دوژمنت بکەن. ئەمە فێڵێك بو ئەو بەکاری بەست. و بەشێوەیەکی ناجوامێرانە هەڵس وکەوتی لەگەڵ موالیەکان کرد چونکە لەکارەکانی ئەوان لەکوفە ڕەنجابو. حەزی دەکرد موالیەکان تێکبشکێن و هیچ کام لەوان ڕزگاری نەبێت. کوڕی شەمیت گومانی فێڵ و فریوی لەو نەکرد. ئەوەی پێشنیاری کرد، جێبەجێی کرد. موالیەکان لەگەڵ ئەو دابەزین.

مەصعەب هات و لەم کاتەدا عەباد کوڕی حوصەینی کردبوە فەرماندەی سوارەکان. عەباد لەئەحمەر کوڕی شەمیت و سوپاکەی نزیك کەوتەوە. ئەحمەر بەعەبادی وت: ئێمە

پێشنیاری گەڕانەوە بۆ نوسراوی خوا و شێوەی پێغەمبەر و بەیعەت لەگەڵ موختارتان پێدەکەین و داواتان لێدەکەین لەگەڵ ئێمە یەك بگرین تا بەراوێژ کاری فەرمانڕەوایی بەیەکێك لەبنەماڵەی پێغەمبەر بسپێرین. عەباد گەڕایەوە و مەصعەبی ئاگادار کردەوە. مەصعەب وتی: بگەڕێرەوە و هێرش بکەرە سەریان. ئەوگەڕایەوە و هێرشی کردە سەر کوڕی شەمیت و سوپاکەی بەڵام کەس لەوان لەشوێنەکەی نەجولا و لەئەسپەکەی نەهاتەخوار. موهەلیب هێرشی کردە سەر کوڕی کامل و هەردولای شەڕ پەلاماری یەکیاندا. کوڕی کامل دابەزی بەڵام موهەلیب پشتی تێکرد. دواتر موهەلیب بەهاوەڵانی خۆی وت: هێرشێکی پیاوانە بکەنە سەریان. ئەوان هێرشێکی گرانیان دەست پێکرد و سوپاکەی موختار پاشەکشێی کرد. کوڕی کامل و دەستەیەك بۆ کاتژمێرێك خۆڕاگریان کرد و دواتر هەڵاتن. خەڵکانی بەگشتی هێرشیان کردە سەر کوڕی شەمیت و ئەو تا کوژران خۆڕاگری کرد. سوپاکەی موختار هاواریان کرد: ئەی خەڵکی خەسعەم و بەجیلە، خۆڕاگری بکەن! موهەلیب پێی وتن: ئەمڕۆ هەڵاتن باشتر رزگارتان دەکات، بۆ خۆتان لەگەڵ ئەم کۆیلانە بەکوشت دەدەن؟ دواتر وتی: سوێند بەخوا من کوژرانی فراوان تەنیا لەناو خەڵکەکەی خۆم دەبینم.

دواتر سوارەکان هێرشیان کردە سەر پیادەکانی کوڕی شەمیت و ئەوانیان تێکشکاند. مەصعەب عەبادی کردە فەرماندەی سوارەکانی خۆی و وتی: هەرکەست بەئەسیری گرت، بیکوژە. محەممەد کوڕی ئەشعەس روبەروی سوپایەکی گەورە لەخەڵکانی کوفە بویەوە و وتی: بۆ تۆڵەی کوژراوەکانی خۆتان داوای خوێن بکەن. ئەوان لەسەر هەڵاتوان سەختگیرتر لەخەڵکانی بەسرە بون چونکە کەسیان بەئەسیری نەدەگرت مەگەر ئەوەی دەیانکوشت. هیچ ئەسیرێکیان نەدەبەخشی. لەو سوپایە جگە لەدەستەیەکی کەم لەسوارکارە ئازاکان کەس رزگاری نەبو. پیادەکان هەمویان لەناوچون و دەستەیەکی کەم لەوان رزگاری بو.

معاویە کوڕی قورەی موزنی دەڵێت: روم کردە پیاوێك لەوان و ڕمەکەم لەچاوی چەقاند و بەردەوام تەکانم دەدا (تا بەئەشکەنجەوە بیکوژم). پێیان وت: بەراستی ئەو کارەت کرد؟ وتی: بەڵێ. خوێنی ئەوان لەو رۆژەدا بۆ ئێمە ڕەواتر بون لەخوێنی دەیلەمیەکان و تورکەکان. معاویە دادیاری بەسرە بو.

کاتێك مەصعەب لەکاری ئەوان تەواو بو، ڕەوانە بو و ڕێگەی لەلای شوێنی (واست)ەوە بڕی. ئە م شارە هێشتا بناغەی دانەڕێژرابو. لەبەر ئەمە روی لەکەشکەر کرد. دواتر پیاوان و نەخۆشەکان و کەرەستەکانی شەڕ و باروبنەی سوار کەشتیەکان کرد وروی لەروباری خرۆشان کرد. هاتنەدەر و ڕۆشتنە روباری قوسان و لەفورات سەریان دەرهێنا.

هەواڵیان بەموختاردا کە سوپاکەی چ شکستێکی بەرکەوتوە و لەوشکی ولەدەریا لەناوچون. خۆی بەرێکەوت تا گەیشتە (سیلحین) و سەیری شوێنی بەریەك کەوتنی روبارەکانی کرد: روباری حیرە، سیلحین، یوسف و قادسیە، لێواری فوراتی بەست بەشێوەیەك ئاوەکەی رژایە ناو روبارەکانیتر وکەشتی خەڵکانی بەسرە لەقوڕ چەقی. کاتێك ئەمەیان بینی، لەکەشتیەکان دابەزین و ئاوەکەیان کردەوە و کەشتیەکان کەوتنە سەر ئاو، دوبارە سەرکەوتنەوە و رویان لەکوفە کرد. موختار بەرەو لای ئەوان غاریدا و لەحەرورا ڕێگەی پێشرەوی ئەوانی بۆ کوفە گرت. ئەو کۆشك و مزگەوتی بەبەهێزی بەجێهێشتبو، بورج و دیوار و شوێنەکانی بەرگری کردنی بۆ ناو دیوار بەستی شارەکە گوێزابویەوە.

مەصعەب هات. فەرماندەی باڵی راست موهەلیب، باڵی چەپ عومەر کوڕی عوبەیداللە و سوارەکان عەباد کوڕی حوصەین. موختار فەرماندەکانی خۆی بەمشێوەیە دەست نیشان کردبو: سەلیم کوڕی یەزیدی کەندی فەرماندەی باڵی راست، سەعید کوڕی مینقەزی هەمەدانی فەرماندەی باڵی چەپ، عەمرۆ کوڕی عەبدالله نەهدی فەرماندەی سوارەکان و مالك کوڕی عەبدالله نەهدی فەرماندەی پیادەکان. محەممەد کوڕی ئەشعەس لەگەڵ هەڵاتوان بۆ کوفە گەڕایەوە و لەنێوان مەصعەب و موختار خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. کاتێك موختار ئەمەی بینی، بۆ هەرکام لە سوپای خەڵکانی بەسرە پیاوێکی خۆی دەستنیشان کرد. خەڵك لەیەك نزیك کەوتنەوە. سەعید کوڕی مینقەز هێرشی کردە سەر خەڵکانی بەکر و عەبدقەیس کە لەباڵی راستی سوپاکەی مەصعەب کوڕی زوبەیر جێگیر بون. هەردولا بەسەختی شەڕیان کرد. مەصعەب نێردراوێکی بۆ لای موهەلیب رەوانە کرد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر سوپاکەی بەرامبەری خۆی. وتی: من لەترسی خەڵکانی کوفە توانای کوشتار کردنی خەڵکانی ئەزدم نەبو تا دەرفەتی خۆم دەستکەوت.

موختار کەسی بۆ لای عەبدالله کوڕی جەعدە کوڕی هوبەیرەی مەخزومی رەوانە کرد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر سوپاکەی بەرابەری خۆی. ئەوان لەخەڵکی عالیە بون. ئەو ریزەکانی ئەوانی تێك شکاند و خۆیان گەیاندە مەصعەب. مەصعەب کەوتە سەر ئەژنۆ و خەڵك بەدوایدا. ماوەیەك شەڕیان کرد و دواتر لەیەك دورکەوتنەوە.

دواتر موهەلیب و سوپاکەی هێرشیان کرد و بەسەختی سوپاکەی موختاریان کوشتار کرد و تێکیان شکاند. لەم کاتەدا عەبدالله کوڕی عومەری نەهدی وتی:خوایە، من لەکاری ئەوان لەبارەگای تۆ بێزاری خۆم دەردەبڕم. ئەمەی سەبارەت بەهاورێکانی خۆی وت کە هەڵاتبون. هەروەها وتی: ئەی خوایە، لەگیانە فیرۆکانی ئەوان پەنا بۆ بارەگای تۆ دەبەم. ئەمەی سەبارەت بەسوپاکەی مەصعەب وت. دواتر شمشێری دەرکێشا و پیاوانە شەڕی کرد تا کوژرا.

سوپاکەی مەصعەب پەرێشان و شڵەژان وەك بڵێی قامیشەڵانێکن کە ئاگریان فرێدابێتە ناویان. لەکاتی نێوارێ، مالك کوڕی عەمرۆ نەهدی کە فەرماندەی پیادەکان بو، هاورێ لەگەڵ پەنجا پیاوی شەرکەر هێرشی برد. ئەو هێرشی کردە سەر سوپاکەی کوڕی ئەشعەس. کوڕی ئەشعەس و هەمو هاورێکانی کوژران.

موختار لەسەر کۆڵانی شەبس بەرگری کرد و سەراسەری شەوی بەشەڕ بەسەر برد. پیاوانێك لەئازاکان و شەرکەران بوێرانە شان بەشانی ئەو شەڕیان کرد بەڵام سەرئەنجام هاورێکانی لەدەوری بڵاوەیان لێکرد. یەکێك لەهاورێکانی پێی وت: ئەی سەروەر، مەگەر مژدەی سەرکەوتنت بەئێمە نەدا؟ ئەتوت ئەوان تێکدەشکێنین؟ وتی: مەگەر لەنوسراوی خوای گەورە نەتخوێندۆتەوە: خوا ئەوەی بیەوێت، دەیسرێتەوە و ئەوەی بیەوێت بەهێزی دەکات و هۆکاری هەمو نوسراوە خواییەکان لای ئەوە (رعد/١٣/٣٩). لەبەر ئەمە ئاماژەمان بەمەدا چونکە موختار یەکەم کەسە ئەندێشەی (بدا) هێنایە ئاراوە (بدا، ئەوەیە کە سەرەتا خوا فەرمانی کارێك دەدات و بەهێزی دەکات بەڵام دواتر دەگەڕێتەوە و فەرمانێکیتر دەدات. ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی، ئەم ئایە دەکەنە بەڵگە).

کاتێك بەرەبەیان روناکی خۆی نیشاندا، مەصعەب و سوپاکەی رویان لەسەبخە کرد. ئەو لای موهەلیب- تێپەڕی کەپێی وت: چ سەرکەوتنێکی بەرچاو! چەندە شیرین بو ئەگەر محەممەد کوڕی ئەشعەس نەدەکوژرا. مەصعەب وتی: راست دەکەیت. دواتر زیادی کرد:

عوبەیدالله کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالبیش کوژرا. موهەلیب وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/١٥٦/٢) مەصعەب وتی: حەزم دەکرد زیندو دەمایەوە و ئەم سەرکەوتنەی دەبینی. دەزانی کێ ئەوی کوشت؟ کەسێك ئەوی کوشت کە گومان دەکات لەشوێنکەوتەکانی باوکی ئەوە.

دواتر لە سەبخە دابەزی و خۆراك و خواردنەوە و هۆکارەکانی ژیانی لەوان درێغ کرد. خەڵك بوێربون بەشێوەیەك کە هاتنەدەر و لەسەر بانی ماڵەکانەوە ئەوانیان تیرباران کرد و ئاوی پیسیان بەسەردا دەکردن. زۆربەی نیازەکانی ئەوان ژنان دەیانهێنایەدی: ژنێك لەناو بنەماڵەکەی خۆی دەهاتەدەر و کەمێك خواردنی لەژێر چارشێوەکەی خۆی هەڵدەگرت و بەرەو لای ئەوان بەڕێدەکەوت. مەصعەب لەم کارە ئاگادار بویەوە و ڕێگەی لەژنان گرت. تینویەتی تەنگی بەهاوڕێیانی موختار هەڵچنی. ئەوانیان ئاویان لەچاڵە ئاوەکان دەردەکێشا و تێکەڵ بەهەنگوینیان دەکرد و دەیانخوارد بەلاَم دەستەیەکی کەم لەوان تێراودەبون.

دواتر مەصعەب فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا و بەرەو کۆشك پێشڕەویان کردو گەمارۆیان خستەسەر. موختار بەیارانی خۆی وت: هاوارلەئێوە! گەمارۆدان تەنیا دەبێتە هۆی لاوازی ئێوە. با دابەزین و شەڕ بکەین و ئەگەر چارەنوسمان کوژران بێت، هاوشێوەی جوامێرەکان بمرین. سوێند بەخوا هیوابڕاو نیم و دڵنیام ئەگەر بەراستی و دروستی شەڕ لەگەڵ ئەوان بکەن، بەسەریاندا سەردەکەون. ئەوان لاوازیان لەخۆیان نیشاندا و فەرمانەکەیان بەکار نەبرد. موختار بەوانی وت: بەلاَم من، بەریسوایی و سوکی ڕازی نابم و ئێوە ناکەمە فەرمانڕەوای چارەنوسی خۆم. ئەگەر بڕۆم و بکوژرێم، جگە لەریسوایی و لاوازی هیچ خەلاَتیەك بۆ ئێوە ناهێنێت. ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی ئەوان ببن و دوژمنەکانتان خۆڕاگری بکەن و ئێوە لەبەرچاوی یەکتر کوشتار بکەن، دەڵێن: خۆزگە فەرمانەکەی موختارمان بەکار دەبەست. ئەگەر لەگەڵ من بێنەدەر، ئەگەری هەیە سەرکەوتن بەدەست نەهێنن بەلاَم مەرگی ئازادنە لەدەست نادەن.

کاتێك عەبدالله کوڕی جەعدە کوڕی هوبەیرە بینی موختار چ مەبەستێکی هەیە، خۆی بەتەناف لەدیواری کۆشکەوە شۆڕ کردەوە و پەیوەستی خەڵکان بو و لای ئەوان خۆی داشارد. دواتر موختار بۆنی خۆشی لەخۆیدا لەگەڵ نۆزدە کەس لەیارانی خۆی لەکۆشك

هاتەدەر.

کاتێك موختار هاتەدەر، بەسایبی وت، چی دەبینی؟ وتی: ئەوەی تۆ دەیبینیت. موختار وتی: هاوار لەتۆ ئەی نەزان! من پیاوێك لەعەرەبەکانم. بینیم کوری زوبەیر لەحیجاز فەرمانڕەوایی گرتۆتەدەست، مەروان لەشام و کوڕی نەجدە لەیەمامە. من هاوتای هەر کام لەوان بوم، جگە لەوەی من بەبیانوی تۆڵە سەندنەوەی بنەماڵەی پێغەمبەر بزوتنەوەکەم دەست پێکرد و ئەم کارەم کاتێك کرد کەعەرەبەکان پشت گوێیان خستبو. ئەگەر لەناو مێشکی پوچی خۆت و دڵی رزاوت هیچ بیرۆکەیەکت نیە، بۆ ناو و نەژادی خۆت بجەنگە. سایب وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەرێینەوە (بقرە /٢/١٥٦) بۆ ناو و نەنگ خۆم بەکوشت بەم کەچی؟ دواتر موختار هێرشی برد و شەڕی کرد تا کوژرا. دوبرا لە بەنی حەنیفە ئەویان کوشت: تەرەفە کوڕی عەبداللە کوڕی دەجاجە و تەراف کوری عەبداللە کوڕی دەجاجە.

کاتێك بەیانی رۆژی دوای کوژرانی موختار گەیشت، بەحیر کوڕی عەبداللە مەسکی دانیشتوانی کۆشکی بۆ خۆڕاگری پیاوانە هاندا بەهەمان شێوە کەموختار ئەو کارەی کرد. ئەوان رازی نەبون و دەستی سوپاکەی مەصعەبیان بۆ سەر خۆیان ئاوەڵا کرد و لەسەر فەرمانی ئەو لەکۆشك رۆشتنەدەر. ئەو بازوی ئەوانی بەستەوە ولەکۆشك بردیاننە دەر. ویستی عەرەبەکان ئازاد بکات و موالیەکان بکوژێت. ئەم کەسانەیان بەبەردەمی ئەودا تێپەڕاند و فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد. بەحیر کوڕی عەبداللە مەسکیان بەبەردەم ئەودا برد. بەمەصعەبی وت: سوپاس بۆ خوا کە ئێمەی بەگرفتاری ئەزمون کرد و تۆی بەبەخشینی ئێمە. ئەمانە دو پێگەن: یەکیان دەبێتە هۆی رەزامەندی خوا و ئەویتریان دەبێتە هۆی تورە بونی خوا. هەر کەس ببەخشێت، خوا دەیبەخشێت و رێزداری دەکات. ئەو کەسەی سزا بدات، لەخوێن و تۆڵە لەئەماندا نیە. ئەی کوڕی زوبەیر، ئێمە شوێنکەوتەکانی قیبلەی ئێوەین و لەسەر ئایینەکەی ئێوە دەژین. نە تورکین نەدەیلەم. ئەگەر لەگەڵ براکانمان لەشارەکەی خۆمان رێگەی ناسازگاریمان گرتەبەر، یا باشمان کردوە یا خراپ. ئەگەری هەیە ئەوان بەرێگەی راستا رۆشتبێتن و ئێمە بەپێچەوانەوە. لەناو خۆماندا شەڕی یەکترمان کرد بەهەمان شێوە کەخەڵکانی شام و دواتر لەگەڵ یەك رێککەوتن بەهەمان شێوە کە خەڵکانی بەسرە یەکیان کوشتار کرد و دواتر ئاشتیان کرد

و کۆبونەوە. بەسەر خەڵکا زاڵبون، کەواتە لێخۆشبون بکەنە پیشە. بەتوانا بون، لێمان خۆشبن. ئەوەندەی لەم قسانە کرد تا ئەوەی دڵی مەصعەب نەرم بو و خەڵك دڵی بۆیان سوتا و مەصعەب مەبەستی ئەوەی کرد ئازادیان بکات.

عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس لەشوێنەکەی هەستا و وتی: ئەوان ئازاد دەکەیت؟ یا ئێمە هەڵبژێرە یا ئەوان! محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەعیدی هەمەدانی هەستا و قسەی هاوشێوەی هێنا سەرزمان. گەورەکانی کوفە هەستان و ئەم قسانەیان هێنایە سەرزمان. مەصعەب فەرمانیدا تا کوشتاریان بکەن. وتیان: ئەی کوڕی زوبەیر ئێمە مەکوژە، ئێمە بۆ بەیانی خۆت رابگرە و وەك پێشەنگ بۆ شەڕی خەڵکانی شام رەوانەمان بکە. ئێوە نیازتان بەئێمە دەبێت. ئەگەر کاروبارەکان لەسەر ئەم بنەمایە بسورێت کە ئێمە بکوژرێین، بەوە رازی نابین تا چەندین بەرابەری خۆمان کوشتار بکەین. ئەگەر بەسەر ئەواندا سەرکەوین، لەبەرژەوەندی ئێمەدایە. مەصعەب رازی نەبو. بەحیری مەسکی وتی: خوێنی من لەگەڵ خوێنی ئەم ریسوایانە تێکەڵ مەکە چونکە فەرمانی منیان ئەنجام نەدا. مەصعەب هەمویانی سەربڕی.

موسافیر کوڕی سەعید کوڕی نەعمانی ناعتی وتی: ئەی کوڕی زوبەیر، بەیانی چی وەڵامی خواوەند دەدەیتەوە؟ خەڵکانێك لەموسوڵمانانت بەئەشکەنجە کوشت کە تۆیان کردە فەرمانڕەوای خوێنی خۆتان ودەستی تۆیان بۆ سەر گیانی خۆیان ئاوەڵا کرد. بەهەمان ئەندازە لەئێمە بکوژن کە لەئێوەمان کوشت. لەناو ئێمەدا کەسانێك هەن تا ئێستا بەشداری هیچ شەڕێکیان نەکردوە. ئەوان لەسواد بون و کاری کۆکردنەوەی و پاراستنی باجیان لەئەستۆدابوە. مەصعەب رازی نەبو و فەرمانیدا بیانکوژن.

کاتێك ویستی ئەوان سەر ببڕێت، لەگەڵ ئەحنەف کوڕی قەیس راوێژی کرد. ئەحنەف وتی: بۆچونی من ئەوەیە لەوان خۆش ببیت چونکە بەخشین لەخواپەرستیەوە نزیکترە (بقرە/ ٢/ ٢٣٧) گەورەکانی کوفە وتیان: ئەوان بکوژە. ئەوان پاڕانەوە بەڵام مەصعەب هەمویانی سەربڕی. کاتێك کوژران، ئەحنەف وتی: ئێوە بەکوشتنی ئەوان تۆڵەی خوێنێکی پێشێلکراوتان نەکردەوە. خۆزگە لەرۆژی هەستانەوە بارێکی قورس لەسەر شانتان نەبێت.

عایشە کچی تەڵحە هاوسەری مەصعەب نێردراوێکی رەوانە کرد تا ئەوان نەکوژێت.

کاتێك پەیك گەیشت، ئەوانی بەکوژراو بینی.

مەصعەب فەرمانیدا دەستی موختار کوڕی ئەبی عوبەیدە ببڕنەوە. بزمارێکیان پیا داکوتی و بەدرگای مزگەوتەوە هەڵیانواسی. دەستی ئەو تا هاتنی حەجاج بەدیوارەکەوە مایەوە. حەجاج بینی و پرسی ئەوە چیە. وتیان: دەستی موختارە. فەرمانیدا تا لەدیوارەکەی بکەنەوە.

مەصعەب کارگوزارەکانی خۆی بۆ سواد و کوێستانەکان ڕەوانە کرد. بۆ ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر نامەیەکی ڕەوانە کرد و فەرمانی فەرمانبەری کردنی خۆی پێدا و وتی: ئەگەر ملکەچی فەرمانی من بیت، شام و ئەو سەرزەمینانەی لەشارەکانی ڕۆژئاوا کەوتونەتە دەست تۆ، تا هەر کاتێك فەرمانڕەوایی بنەماڵەی زوبەیر بەردەوام بێت، بۆ تۆ بێت. پەیمانیدا و سوێندی خوارد کە وتەکانی خۆی دەهێنێتەدی. ئیبراهیم لەگەڵ یارانی خۆی راوێژی کرد و ئەوان بەشێوەی جۆراوجۆر قسەیان کرد. ئیبراهیم وتی: ئەگەر کوڕی زیاد و گەورەکانی شامم نەکوشتبو، هەرچەندە لەپێشی بەهیچ کەسێك بەسەر بنەماڵە و شارەکەی خۆم نابەخشم، عەبدولەلیکم هەڵدەبژارد. نامەی بۆ مەصعەب نوسی و ئاگاداری کردەوە کە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات. مەصعەب نوسی: لەزوترین کاتدا وەرە. ئەو هات و ملکەچی فەرمانەکانی مەصعەب بو. کاتێك مەصعەب بیستی ئەو بەرێکەوتوە، موهەلیبی بۆ سەر کارەکانی لەموسڵ، جەزیرە، ئەرمەنستان وئازەر ئابادگان ڕەوانە کرد.

دواتر مەصعەب، سابت کچی سەمورە کوڕی جوندەب و عومرە کچی نەعمان کوڕی بەشیرەی ئەنساری (هەردو ژنەکەی موختار)بانگ کرد و لەم دوانە سەبارەت بەموختار پرسیاری کرد. دایکی سابت وتی: سەبارەت بەو هەمان شت دەڵێین کە تۆ دەیڵێیت. مەصعەب ئەوی ئازاد کرد. عەمرە وتی: خوا لێی خۆش بێت، پیاوێکی شیاو بو. ئەوی زیندانی کرد و بۆ براکەی عەبدالله کوڕی زوبەیری نوسی: ئەم ژنە گومان دەکات موختار پێغەمبەرە. فەرمانیدا تا بیکوژن. ژن شەوانە لەنێوان کوفە تا حیرە کوژرا. یەکێك لەپاسەوانەکان ئەوی کوشت. پیاوەکە سێ جار بەشمشێر لێیدا و ژن هاواری دەکرد: ئای باوکە گیان، ئەی خزم و کەس و کارەکەم! پیاوێك دەستی بەرز کردەوە و شەقەزللەیەکی لێدا و وتی: ئەی پیاوی پەست، ئەشکەنجەی دەدەیت. لەخوێنی خۆیدا

پەلەقاژەی دەکرد تا مرد. پاسەوان ڕێبوارەکەی گرت و ئەوی بردە لای مەصعەب کوڕی زوبەیر. مەصعەب وتی: ئازادی بکەن، کارێکی جەرگ هەژێنی بینی و نەیتوانی خۆی بگرێت. عومەر کوڕی ئەبی رەبیعەی مەخزومی لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| ان من اعجب العجائب عندی | قتل بيضاء حرة عطبول |
| قتلت هكذا على غير جرم | ان لله درها من قتيل |
| كتب القتل و القتال علينا | و على المحصنات جر النيول |

یانی: یەکێك لەسەیرترین سەرسورهێنەرەکان لای من، کوژرانی ژنێکی ئازادەی گەردن بەرزی مانگ روخسارە. ئەو بەشێوەیەکی هەژێنەر کوژرا بێ ئەوەی دەستی بەخوێنی کەسێك پیس کردبێت، خوا بیپارێزێت چونکە کوژراوێکی ڕێزدار بوا کوژران و کوژران بۆ ئێمە نوسراوە، ژنانی کردە هاوسەر و باشترە خەرامان خەرمان بەسەر زەویدا بڕۆن.

هەروەها سەعید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حەسان کوڕی سابت لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| اتی راكب بالامر ذی النبا العجب | بقتل ابنة النعمان ذی الذين و الحسب |
| بقتل فتاة ذات دل ستيرة | مهذبة الاخلاق و الخيم و النسب |
| مطهرة من نسل قوم اكارم | من الموثرين الخير فی سالف الحقب |
| خليل النبی المصطفی و نصيره | و صاحبه فی الحرب و الضرب و الكرب |
| اتانی بان الملحدين توافقوا | على قتلها لا جنبوا القتل و السلب |
| فلا هنات ال الزبير معيشة | و ذاقوا لباس الذل و الخوق و الحرب |
| كانهم اذ برزوها و قطعت | باسيافهم فازوا بمملكة العرب |
| ا لم تعجب الاقوام من قتل حرة | من المحصنات الدين محمودة الادب |
| من الغافلات المومنات بريئة | من الذم و البهتان و الشك و الكذب |
| علينا كتاب القتل و الباس واجب | و هن العفاف فی الحجال و فی الحجب |
| على دين اجداد لها و ابوة | كرام مضتلم تخز اهلا و لم ترب |
| من الخفرات لا خروج بذية | ملائمة تبغة على جارها الجنب |
| و لا الجار ذی القربی و لم تدرما الخنا | و لم تزدلف يوما بسوء و لم تجب |
| عجبت لها اذ كتفت و هی حية | الا ان هذا الخطب من اعجب العجب |

یانی، سوارەیەك هات و هەواڵێکی سەیر و بناغە روخێنی هێنا، وتی کچی نەعمان، ئەو

پیاوە دیندارە بەناپیاوی کوژرا. هەواڵی کوژرانی کیژێکی هێنا گەنج و روخۆش و سەنگین و داپۆشراو، هەڵگری کردارێکی پاك، خاوەن نەژاد و بنەماڵەیەکی گەورە. ژنێکی پاك لەنەژادی خەڵکێکی رێزدار کە چاکە دەکەنە پیشەی خۆیان و لەرۆژگاری کۆنەوە بەم شێوە بون. هاورێ و هاوەڵی تایبەتی پێغەمبەر، هاورێی ئەو لەشەرەکان و لەگرفتاری و شادیەکان، بەمنیان راگەیاند کە بێ دینەکان بۆ کوشتنی ئەو یەکیان گرتوە، خۆزگە هیچ کات لەکوشتنی و تالآن کران دور نەبن. خۆزگە دوای ئەمە هیچ کات ژیان بۆ بنەماڵەی زوبەیر بەخۆشی نەڕوات، خۆزگە جل وبەرگی ریسوای و ترس و شەڕیان لەبەر بکرێت. وەك بڵێی کاتێك ئەو ژنەیان هێنا و بەشمشێرەکانی خۆیان لەت لەتیان کرد، دەستیان بەسەر وڵاتی عەرەبەکاندا گرتوە. ئایا خەڵکان لەکوژرانی ئەو ژنە سەریان سوڕنەما. ژنێکی داوێن پاکی سەنگین، وەسف کراو، خاوەن فەرهەنگ. خواپەرەست، دور لەهەر شتێك جگە لەخوا، بێ گوناح، دور لەسەرکۆنە و درۆ و گومان و فشە. نوسراوی خواوەند، جەنگ و کوشتن و کوژران و شەری بۆ ئێمە پیاوان کردۆتە ئەرکێکی پێویست، ئەوان داوێن پاکەکانن کە شوێنیان ماڵە داپۆشراوەکان بەپەردە لەژێرچنراوەکانی شەرم و هەڵاتنە. ئەو ژنە لەسەر ئایینی باب و باپیرە رێزدارەکانی خۆیەتی، نە نەنگی خستە سەر شانی کەسەکانی، نە هاوسەرەکەی گومانی لێی کرد. ژنێکی شەرمێون کە نە لەماڵ دێتەدەر، نەستەم لەدراوسێکەی دەکات، هەمیشە سازگارە و بەدرەوام رام و دەستەمۆ. ستەم لەدراوسێی نزیکیش ناکات، زمان بۆ جوێن ناکاتەوە وبۆ کارێکی ناپێویست و نەشیاو لەماڵ ناچێتەدەر. سەرمسوڕما کە بازوی ژنێکی زیندویان بەست، بەڵێ ئەمە لەسەیرترین سەرسورهێنەرەکانی جیهانە.

دەستەیەك دەڵێن: موختار دوای هاتنی مەصعەب کوڕی زوبەیر بۆ بەسرە، ناسازگاری خۆی لەگەڵ عەبدالله کوڕی زوبەیر ئاشکرا کرد. مەصعەب روی لەشەڕی ئەو کرد و بیستی کەموختار مەبەستی ئەوی کردوە، لەبەر ئەمە موختار، ئەحمەر کوڕی شەمیتی بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد چونکە بیستبوی (پێشگۆکان وتویانە کە) پیاوێکی سەقەفی لەمەزار سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنێت. گومانی کرد سەرکەوتن بەسەر مەصعەب لەمەزار دەبێت. گومانی کرد پیاوە سەقەفیەکە خۆیەتی. نەیزانی کەئەو پیاوە حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی لەشەڕ دژی عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەسە.

مەصعەب، عەبادی حەتەمی هاندا بۆ رەوانە بون بۆ شەڕی موختار. ئەو پێشڕەوی کرد و عوبەیدالله کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب لەگەڵ ئەو. مەصعەب لەروباری (بصرین) مایەوە و موختار بەبیست هەزار پیاوی شەرکەر پێشڕەوی کرد. مەصعەب و سوپاکەی پێشڕەویان کرد و شەوانە گەشتنە سەر سەریان. موختار بەیارانی خۆی وت: هیچ کەس لەشوێنەکەی خۆی نەجوڵێت تا دەنگی کەسێك دەبیستن کە دەڵێت: ئەی محەممەد، کاتێك ئەم دەنگەتان بیست، هێرش بکەن.

کاتێك مانگ دەرکەوت، بەکەسێکی وت و هاواری کرد: ئای موحەممەد! ئەوان هێرشیان کردە سەر سوپاکەی مەصعەب بەڵام سوپاکەی مەصعەب ئەمانیان بۆ شوێنەکەی خۆیان گەڕاندەوە و تێکیانشکاندن. سەراسەری شەو شەڕیان کرد. موختار گەیشتە بەرەبەیان و بینی کەسی لەگەڵدا نەماوەتەوە و سوپاکەی تیکەڵ بەسوپاکەی مەصعەب بون و بڵاوەیان لێکردوە. موختار تێکشکاو گەڕایەوە و ڕۆشتە ناو کۆشك. هاورێکانی هاتن و ماوەیەك چاوەڕوانیان کرد بەڵام ئەویان نەبینی و وتیان کوژراوە. هەر کەس توانی هەڵات و لەماڵەکانی کوفە خۆی شاردەوە. هەشت هەزار کەس لەوان رویان لەکۆشك کرد و موختاریان لەوێ بینی. هێرشیان کردە سەریان. ئەوان لەو شەوەدا دەستەیەك لەسوپاکەی مەصعەبیان کوشتار کردبو کە یەکێك لەکوژراوەکان محەممەد کوڕی ئەشعەس بو. مەصعەب هات و گەمارۆی خستە سەر کۆشکەکە بۆ ماوەی چوار مانگ. موختار رۆژانەدەهاتەر و لەبازاری کوفە شەڕی لەگەڵ دەکردن.

کاتێك موختار کوژرا، دانیشتوانی کۆشك، کەوتنە سەر زەوی و کەسیان رەوانە کرد و داوای ئەمانیان کرد. مەصعەب رازی نەبو و ئەوان لەسەر فەرمانی ئەو لەکۆشك هاتنەدەر. ئەو لەعەرەبەکان نزیکەی حەوتسەد کەسی کوشت و لەعەجەمەکان ژمارەیەکی زیاتر. ژمارەی کوژراوەکان شەش هەزار کەس بو. ئەو رۆژەی موختار کوژرا، تەمەنی شەست و حەوت ساڵ بو. کوژرانی ئەو چواردە رۆژی یەکەمی رەمەزانی ساڵی شەست و حەوت / ٣ ئاوریلی ٦٨٧ زایینی بو.

دەڵێن، مەصعەب چاوی بە عەبدالله کوڕی عومەر کەوت. پێی وت: من برازاکەت مەصعەبم. کوڕی عومەر وتی: تۆ ئەو کەسەیت لەیەك بەرەبەیان حەوت هەزار کەست کوشت و حەوت هەزار موسوڵمانت سەربڕی و ئەمە جگە لەو کەسانەی لەگۆڕەپانی شەڕ

کوژران. مەصعەب وتی: دەستەیەك ناباوەڕ و خراپەكار بون. كوڕی عومەر وتی: ئەگەر بەژمارەی ئەوان لەمەڕەكانی باوكتت سەردەبڕی، ئەم كارەت دەبوە زێدەڕۆیی.

دوای كوژرانی موختار، كوڕی زوبەیر بە عەبداللە كوڕی عەباسی وت: ئایا هەواڵی كوژرانی ئەو پیاوە درۆزنە بەتۆ نەگەیشتوە؟ وتی: ئەو درۆزنە كێیە؟ وتی: كوڕی ئەبو عوبەید. كوڕی عەباس وتی: بەمنیان وتوە كەموختار كوژراوە. كوڕی زوبەیر وتی: دەڵێی پێت خۆش نیە كە بەدرۆزن ناوی دەبەم، دەڵێی بۆ مەرگی ئەو بەنازاریت. كوڕی عەباس وتی: ئەو بكوژەكانی ئێمەی كوشت و تۆڵەی خوێنی ئێمەی كردوە و داخی دڵی ئارام كردین و لەبەر ئەمە پاداشتی ئەو لای ئێمە سەركۆنە كردن و جوێندان بەو نیە و ئێمە ناتوانین بەدرۆزن ناوی ببەین.

دوبارە عوروە كوڕی زوبەیر بە عەبداللە كوڕی عەباسی وت: پیاوە درۆزنەكە كوژرا و ئەمە سەری ئەوە. كوڕی عەباس وتی: لەبەرابەر ئێوە گەردەنەیەكی دژوار و بڵند بەجێ ماوە كە ئەگەر بتوانن بەسەریدا سەركەون، ئێوە ئێوەن وەگەرنە هیچ نین. مەبەستی عەبدولمەلیك كوڕی مەروان بو.

دەڵێن: دیاریەكانی موختار بە عەبداللە كوڕی عومەر و محەممەد كوڕی حەنیفە دەگەیشت و ئەم دوانە لێیان وەردەگرت. دەستەیەك دەڵێن: كوڕی عومەر دیاریەكانی دەگەڕاندەوە.

## لەسەر کار لابردنی مەصعەب کوڕی زوبەیرو دانانی حەمزە کوڕی عەبدالله کوڕی زوبەیر

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر، براکەی خۆی مەصعەب کوڕی زوبەیری لەفەرمانداری بەسرە دورخستەوە و لە جیاتی ئەو کوڕەکەی حەمزە کوڕی عەبداللەی بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرد. ئەمە دوای کوژرانی موختار بو. حەمزە پیاوێکی بەخشندە بەڵام هەڵس وکەوتەکانی تێکەڵ بو: هەندێ کات بەفراوانی دەیبەخشی و هیچی لەدەستی خۆی نەدەهێشتەوە و هەندێك کات ڕێچکەی سواڵکەرانی دەگرتەبەر کە هاوشێوەی نەبینراوە. لەبەسرە کاری لاواز و نەشیاوی لێ بینرا. ڕۆژێك سوار بو وبەرزبونەوەی ئاوی روبارەکانی بەسرەی بینی. وتی: ئەگەر خەڵکانی بەسرە لەگەڵ ئە م ئاوە بەنەرمی هەڵس و کەوت بکەن، بێ گومان بەشی هاوینیان دەکات. چەند ڕۆژێکیتر بینی ئاو دامرکاوەتەوە. وتی: من وتم: ئەگەر کەم کەم لێی هەڵبگرن، بەشیان دەکات؟ کاری نەزانانەی زۆری لێ بینرا. ئەحنەف کوڕی قەیس نامەی بۆ عەبداللەی باوکی نوسی کە حەمزە لەسەر کار لاببات و مەصعەب لەجێگەی دابنێت. ئەو حەمزەی لەسەر کار لابرد. حەمزە سامانێکی زۆری لەبەسرە هەڵگرت تا لەگەڵ خۆی بیبات. مالك کوڕی میسمەع ڕێگەی لێگرت و وتی: ڕێگە نادەین سامانی ئێمە ببەیتەدەر. عوبەیدالله کوڕی عەبدالله بەڵێنیدا لەکاتی خۆیدا بەخششەکان بدەن و مالك دەستی لێ هەڵگرت. حەمزە سامانەکانی هەڵگرت و بەرەو مەدینە ڕەوانە بو و تەسلیم بەچەند کەسێکی کرد. هەمویان وتیان هیچ شتێکی بەئێمە نەسپاردوە جگە لەیەك کەس کە ئەمانەتیەکەی گەڕاندەوە. هەواڵی ئەم کارە بەباوکی گەیشت. وتی: خوا بیکوژێت. دەمویست بەبونی ئەو شانازی بەسەر مەروانیەکان بکەم بەڵام ئابروی منی برد.

دەستەیەك دەڵێن: مەصعەب تا یەك ساڵ دوای کوژرانی موختار لەکوفە مایەوە و لەماوەی ئەو ساڵەدا لەفەرمانداری کوفە دورخرایەوە. براکەی عەبدالله ئەوی لەسەر کارلابرد و حەمزەی کوڕی لەجێگەکەی دانا. دواتر مەصعەب ڕۆشتە سەردانی براکەی تا فەرمانداری بەسرە بۆ ئەو بگەڕێنێتەوە. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو، بەڵکو مەصعەب بەدوای کوشتنی موختار ڕۆشتە بەسرە و حارس کوڕی ئەبی ڕەبیعەی وەك

جێگری خۆی لەکوفە دەستنیشان کرد. هەردوك کارگوزاری کوڕی زوبەیر بون. براکەی ئەوی لەبەسرە هەڵگرت و جێگەکەی بەکوڕەکەی پڕکردەوە. دواتر بەنامەی ئەحنەف کوڕی قەیس حەمزی لەسەر کار لابرد و مەصعەبی بۆ شوێنەکەی گەڕاندەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. کارگوزارەکانی لەکوفە و بەسرە ئەو کەسانە بون کەئاماژەمان پێدان. سەرپەرەستی کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی عەبدالله کوڕی عوتبە کوڕی مەسعود و لەبەسرە لەئەستۆی هشام کوڕی هوبەیرە بو. فەرمانڕەوای شام عەبدولمەلیك کوڕی مەروان و لەخوراسان کوڕی خازم.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: ئەحنەف کوڕی قەیس لەبەسرە لەگەڵ مەصعەب کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧١/ ٦٩٠ زایینی لەکاتی رەوانە بونی مەصعەب بۆ شەڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان چاوی لەجیهان پۆشی. هوبەیرە کوڕی مریەم کۆیلەی حسین کوڕی عەلی کە لەیارانی موختار بو و لەخارز کوژرا. یەکێکە لەو کەسانەی حەدیسی گێڕاوەتەوە. جونادە کوڕی ئومەییە کە رۆژگاری جاهلییشی بینی. ئەو چاوی بەپێغەمبەر نەکەوتبو، عەبدولرەحمان کوڕی حوجر کوڕی عودەی و عەبد رەب کوڕی حوجر کوڕی عودەی و عیمران کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان کەمەصعەب هەرسێکیانی بەئەشکەنجە کوشت و ئەمە دوای کوشتنی موختار و هاوڕێکانی بو.

## روداوەکانی ساڵی شەست و هەشتی کۆچی (٦٨٧ – ٦٨٨ زایینی)

## لەسەر کار لابردنی حەمزە لەفەرمانداری بەسرەو دەستنیشان کردنی مەصعەب

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی زوبەیر براکەی مەصعەبی بۆ فەرمانڕەوایی عێراق گەڕاندەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبو کەئەحنەف کوڕی قەیس ئەزانی لەحەمزە کوڕی عەبداللە بینی و نامەی بۆ باوکی نوسی و لەکارەکانی حەمزە ئاگاداری کردەوە. ئەو مەصعەبی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە و حارس کوڕی ئەبی رەبیعەی کردە فەرمانداری کوفە.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری لەسەر کار لابردنی حەمزە لەفەرمانداری بەسرە ئەوە بو کەئەو ڕێزی گەورەکان و سەروەرانی نەدەگرت و دەستی خۆی بەسەر ئەواندا ئاوەڵا کرد و ئەوان گلەییان بردە لای مالك کوڕی میسمەع. مالك لەسەر پرد خێوەتی هەڵدا و کەسی بەدوای حەمزەدا رەوانە کرد و پەیامیدا: بڕۆ لای باوکت. ئەوی لەبەسرە دور خستەوە. عەدیلی عەجلی لەمبارەوە وتی:

اذا ما خشينا من امير ظلامة          دعونا اباسفيان يوما فعسكرا

یانی: ئەگەر لەفەرماندارەکەی خۆمان بترسین کەستەم لەسەر ئێمە رەوا بکات، ئەبوسوفیان بانگ دەکەین وئەو لەسەر پرد خێوەت هەڵدەدات و ئەو فەرماندارە ستەمگەرە لەئێمە دوردەخاتەوە.

## بزوتنەوەی خەواریج لە پارس و عێراق

مەصعەب لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عوبەیداللەی کردە فەرمانڕەوای پارس و فەرمانی پێدا لەگەڵ ئەزرەقیەکان شەڕ بکات. لەیەکەم رۆژەکانی فەرمانڕەوایی مەصعەب و لەسەردەمی حەمزە کوڕی عەبداللە کوڕی زوبەیر، موهەلیب بۆ ئەم کارە دەستنیشان کرابو. کاتێك مەصعەب بۆ سەر کارەکەی خۆی گەڕایەوە، مەبەستی ئەوەی کرد موهەلیب بکاتە فەرمانڕەوای موسڵ و ئەرمەنستان و جەزیرە تا لەنێوان ئەو و عەبدولەلیك کوڕی مەروان جێگیر ببێت. کاتێك لەپارس بو، نامەی بۆنوسی و فەرمانی

پێدا بۆ لای خۆی بگەرێتەوە. ئەو هات و کورەکەی موغەیرە کوری موهەلیبی کردە فەرمانرەوای ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی و فەرمانی پێدا دورئەندێشی و ئار ـ لەکاروبارەکان بکاتە پیشە. ئەو لەبەسرە رۆشتە لای مەصعەب کەئەوی لەفەرماندەیی شەر لەگەڵ خەواریج دورخستەوە و سەرزەمینی پارسی لێسەندەوە و بۆ هەردو کارەکە عومەر کوری عوبەیدالله کوری مەعمەری دەست نیشان کرد. کاتێك خەواریج هەواڵی هاتنی ئەویان بیست، قەتەری کوری فەجائە وتی: پیاوێکی ئازا بۆ شەری ئێوە دێت، ئەو هەم ئازایە هەم پاڵەوان، هات تا بۆ پاسەوانی کردن لەدینەکەی خۆی و فەرمانرەوای کردن بەسەر ئێوە شەر دەست پێبکات. بەسرشتێکەوە هات کە لەکەسدا نەمبینوە. لەهیچ شەرێك ئامادە نەبو مەگەر ئەوەی یەکەم شەرکەر بو کە بەرابەرەکەی خۆی دەکوشت.

خەواریج دوای کوژرانی عەبدالله کوری ماحوز، براکەی ئەو زوبەیر کوری ماحوزیان کردبوە سەرکردەی خۆیان و ئەمە بەهەمان شێوە بو کە لەروداوەکانی ساڵی شەست وپێنجی کۆچی / ٦٨٥ زایینی ئاماژەمان پێدا. خەواریج رۆشتنە شاری ئیستەخر. عومەر کورەکەی عوبەیداللەی هاورێ لەگەڵ سوارەکان رەوانە کرد کە هاوشێوەی پێشەنگەکان شەر بکات تا خۆی بگات. شەر رویدا و عوبەیدالله کوری عومەر کوژرا. زوبەیر کوری ماحوز بریاریدا شەر لەگەڵ عومەر کوری عوبەیدالله بکات. قەتەری وتی: عومەر بژاردەی بژاردەکانە، شەر لەگەڵ ئەو مەکە. ئەو رازی نەبو و شەری لەگەڵ عومەر دەست پێکرد. لەناو سوارەکانی خەواریج نەوەد شەرکەر کوژران. عومەر بەرم لەصالح کوری موخاریقدا و چاوی ئەوی تا قولای کاسەی سەری هەڵتەکاند. هەروەها کەلەکەی قەتەری هەڵدری. خەواریج شکستیان خوارد و بەرەو شاپوور بەرێکەوتن. عومەر گەرایەوە و لەوێ روبەرویان بویەوە و شەری کرد و موجاعە کوری سیعر هاورێیەتی دەکرد. موجاعە بەگورزە ئاسنینەکەی خۆی چواردە کەسی لەخەواریج کوشت. ئەوەندەی نەمابو عومەر لەم شەرەدا بکوژرێت کەموجاعە بەرگری لێکرد. عومەر لەبەرابەر ئەم کارەی، نۆسەد هەزار درەمی پێ بەخشی. پیاوێك لەمبارەوە وتی:

قد ذنت عادية الكتيبة عن فتى      قدكان يترك لحمه اقطاعا

یانی: من زیانی شەرکەرەکانم لەجوامێرێك دورخستەوە کە ئەوەندەی نەمابو

گۆشتەکانی جەستەی لەت لەت بین.

بەسەر ئەواندا سەرکەوت. خەواریج بەرێکەوتن و ئەو پردەی لەنێوان خۆیان و ئەواندا بو، روخاندیان تا نەتوانێت شوێنیان بکەوێت. دواتر رویان لەئیسفەهان کرد. لەوێ مانەوە تا هێزیان وەرگرت و بۆ شەڕ ئامادە بون. دواتر بەرەو پارس بەرێکەوتن کەعومەر لەوێ بو. بەرەو شاپوور بەرێکەوتن و دواتر ئەرجان و لەوێوە ڕۆشتنە ناو ئەهواز.

لەم کاتەدا مەصعەب وتی: ئەم عومەرە پیاوێکی سەیرە! ئەو دوژمنەی شەڕیان لەگەڵ دەکات، بەسەرزەمینەکەی ئەو تێپەڕین و ئەو شەرکردن لەگەڵ ئەوانی پشت گوێ خست. ئەگەر شەڕی دەکرد و رایدەکرد، بەڵگەیەکی بەهێزی دەبو. نامەی بۆ نوسی: ئەی کوڕی مەعمەر، جوامێریت لەگەڵ من نەکرد، باج وەردەگریت و لەبەرابەر دوژمن رادەکەیت. ئەوان لەناو ببە و ئاسودەمان بکە.

عومەر تێکۆشەرانە لەپارسەوە بەدوای ئەواندا بەرێکەوت و هیوای دەبرد دوای ڕۆشتنی ئەوان بۆ وڵاتی عێراق، ئەوان بدۆزێتەوە. مەصعەب هاتە دەر و لەشوێنی (پردی نیشتمان) ئوردوی لێدا و خەڵك لەگەڵ ئەودا بون. خەواریج کە لەئەهواز بون، بیستیان کەعومەر شوێنیان کەوتوە و مەصعەبیش بەمەبەستی شەڕ لەگەڵ ئەوان لەبەسرە هاتۆتەدەر. زوبەیر کوڕی ماحوز وتی: بۆچونێکی قێزەونە ئێوە لەناو ئەم دو دەستەیە ریسوا ببن. با هێرش بکەینە سەر دوژمن بۆ ئەوەی تەنیا لەیەك بەرەوە روبەرویان ببینەوە. ئەوانی هەڵگرت وبەرێکەوت و پانتاییەکانی جوخی و ئەرەواناتی بڕی و هاتە مەداین و بینی لەوێ کەردەم کوڕی مورسدی فورادی بەسەردەبات. هێرشیان کردە سەر خەڵکانی مەداین. ژنان و پیاوان و منداڵانیان کوشت و سکی دوگیانەکانیان هەڵدری. کەردم هەڵات و ئەوان رویان لەسابات کرد و شمشێریان خستە ناو خەڵك و تا توانیان سەریان بڕی و خوێنیان ڕشت و سوتاندیان و کاولکاریان لەدوای خۆیان بەجێهێشت. خراپەکاران ئەم کارانەیان لەژێر ناوی خوادا دەکرد. دەستەیەکیان بۆ کەرخ رەوانە کرد کەچاویان بەئەبوبەکر کوڕی مێخنەف کەوت. ئەو شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد. ئەبوبەکر کوژرا و هاورێکانی هەڵاتن وخەواریج خراپەکاریان لەو سەرزەمینەدا بڵاو کردەوە.

کوفیەکان ڕۆشتنە لای فەرماندارەکەی خۆیان کە حارس کوڕی ئەبی رەبیعە ناسراو

بەناوی قوباع بو، هاواریان کرد و وتیان: وەرەدەر چونکە دوژمن هێرشی کردوینەتەسەر بەلام هێزێکی زۆریان نیە. ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر هەستا و بۆ ڕۆشتن هانیدا. ئەو بەرێکەوت تا لەدێری عەبدولرەحمان دابەزی و لەوێ مایەوە تا شەبس کوڕی ڕێبعی گەیشتە لای. دواتر ئیبراهیم پێی وت بۆ پێشەوە بڕوات. کاتێك خەلك بینیان ئەو لەم کارەدا لاوازی لەخۆی نیشان دەدات، وتیان:

ساربنا القباع سیرا نکرا          یسیر یوما و یقیم شهرا

یانی: قوباع شێوەی پێشڕەوی زۆر ناسازگاری لەگەڵ ئێمە گرتۆتەبەر. ڕۆژێك پێشڕەوی دەکات و یەك مانگ چاوەڕێ دەبێت.

لەوێش ڕەوانە بو. لەهەر شوێنێك دادەبەزی، خەلك هاواریان دەکرد دوبارە پێشڕەوی بکات. ئەو لەماوەی حەفدە ڕۆژ گەیشتە فورات. گەیشتە ئەو سامانە و بینی خەواریجیش گەیشتون. خەواریج پردەکەی نێوان خۆیان و ئەوانیان کاولکرد و پیاوێك بەناوی سیماکیان لەگەڵ کچەکەی دەستگیر کرد, کچەکەیان برد تا سەری ببڕن. بەوانی وت: ئەی برا موسوڵمانەکان، باوکم نەخۆشە، مەیکوژن، من کچێکی بێ تاوان زیاتر نیم، سوێند بەخوا هەرگیز کارێکی نەشیاوم لەگەڵ داوێنی پاکی خۆم نەکردوە، دراوسێم نەرەنجاندوە، نەڕۆشتومەتە  سەربان و لەکونی دەرگاوە نەمڕوانیوە. کاتێك ویستیان بیکوژن، کەوتە سەرزەوی و لەترسا مرد. دواتر بەشمشێر لەت لەتیان کرد. سیماك لەگەڵیان مایەوە تا گەیشتنە سەرەوەی (صراط). ئەو روی کردە خەلکی کوفە و وتی: ڕوبەرویان ببنەوە چونکە دەستەیەکی کەم و ڕیسوان. ئەویان سەربڕی و لەداریاندا.

ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر بەحارسی وت: بەخەلکان بڵێ لەگەڵ من بەرێکەون تا بۆ لای ئەم خراپەکارانە پێشڕەوی بکەم و سەرە براوەکانی ئەوان بێنمە لای تۆ. شەبس و ئەسما و یەزید کوڕی حارس و محەممەد کوڕی عومەیر و کەسانیتر وتیان: خوا فەرمانڕەوا بپارێزێت، با تێپەڕن. وەك بڵێی ڕژدیان بەئیبراهیم دەبرد.

کاتێك خەواریج زۆری خەلکانیان بینی، پردەکەیان پچڕاند. حارس ئەمەی بەدەرفەت زانی و لەبەرابەر خەلك دانیشت و وتی: دوای سلاو، سەرەتا شەڕ بەتیرباران کردنە، دوای ئەوە بەرز کردنەوەی ڕمەکان، دواتر چەقاندنی لە جەستەی دوژمنان، بەدوای ئەوە وەشاندنی گورزی سەخت و سەرئەنجام دەرکێشانی شمشێرەکان. پیاوێك وتی: ئەی

فەرماندار، جوان وەسفت کرد بەڵام کەی دەبێت ئەم ئامۆژگاریانە بەکار ببەین؟ لەنێوان ئێمە دەریایەکە، چۆن روبەرویان ببینەوە؟ فەرمان بدە تا ئەم پردە هەڵببەستنەوە تا لێی تێپەڕین و هێرشیان بکەینەسەر و ئەوسا تۆ ئەوە دەبینی کە ئارەزوی دەکەیت.

پردەکەیان هەڵبەستوە و خەڵك تێپەڕین و خەواریجیان تامەداین دورخستەوە. چەند کەسێك لەسوارکارە ئازاکان لەسەر پردەکە، بۆ ماوەیەکی کەم شەڕیان تاقی کردەوە و دواتر گەڕانەوە. حارس، عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەفی لەگەڵ شەش هەزار پیاوی شەرکەر بەدوای ئەواندا رەوانە کرد تا لەدەوروبەری کوفە دوریان بخاتەوە. پێی وت: کاتێك هەنگاویان نایە سەرزەمینی بەسرە، وازیان لێ بێنە. عەبدولرەحمان پاشەکشێی پێکردن تا گەیشتنە سەرزەمینی ئیسفەهان. گەڕایەوە و شەڕی لەگەڵ ئەوان نەکرد. ئەوان مەبەستی شاری رەی یان کرد کە فەرماندارەکەی یەزید کوڕی حارس کوڕی رویەمی شەیبانی بو. شەڕی لەگەڵ کرد، بەڵام خەڵکانی رەی پشتی خەواریجیان گرت. یەزید کوژرا و کوڕەکەی حەوشب کوڕی یەزید هەڵات. باوکی بانگی کرد تا بەرگری لێ بکات بەڵام کوڕ رازی نەبو. یەکێك لەوان وتی:

فلو كان حرا حوشب ذا حفيظة رای ما رای فی الموت عيسی من مصعب

یانی: ئەگەر حەوشب جوامێر و دەماری پیاوەتی دەبو، ئەوەی لەمەرگ دەبینی کە عیسا کوڕی مەصعەب بینی.

مەبەستی ئەوە بو عیسا کوڕی مەصعەب لای باوکی راینەکرد بەڵکو ئەوەندە شەڕی کرد تا کوژرا.

رۆژێك حەوشب کوڕی یەزید و عێکرەمە کوڕی رێبعی لای بشر کوڕی مەروان بون. بشر وتی: چ کەسێك سەمەندێکی تیژ پێ نیشانی من دەدات؟ عێکرەمە وتی: ئەوەی تۆ دەتەوێت ئەسپەکەی حەوشبە کەئەوی لەشەڕی رەی دەرباز کرد. رۆژێکیتر بشر وتی: چ کەسێك ئێسترێکی بەهێز و گەورە نیشانی من دەدات؟ حەوشب وتی: ئەوەی تۆ دەتەوێت ئێسترەکەی واسل کوڕی موسافیرە. لەو رۆژەدا واکەوتبوە سەرزاران کە عێکرەمە دڵداری لەگەڵ ژنەکەی واسڵ دەکات. بشر پێکەنی و وتی: دادی خۆتت وەرگرت.

کاتێك خەواریج لەرەی تەواو بون، بەرەو ئیسفەهان شۆڕبونەوە و گەمارۆیان خستەسەر. فەرماندارەکەی عەتاب کوڕی وەرقا بو. ئەو لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری کرد. خەواریج

لەدەروازەی شار لە گەڵ ئیسفەهانیەکان شەڕیان دەکرد و ئیسفەهانیەکان لەسەر دیوارەکانەوە تیرباران و بەردبارانیان دەکردن. عەتاب پیاوێکی لەحەزرەمەوت لەگەڵدابو کە پێی دەوترا ئەبو هورەیرە. ئەو هێرشی دەکردە سەر ئەوان و دەیوت:

کیف ترون یا کلاب النار      شد ابی هریرة الهرار

یهرکم باللیل و النهار      یا ابن ابی الماحوز و الاشرار

کیف تری حربی علی المضمار

یانی: ئەی سەگەکانی جەهەننەم، گورزەکانی ئەبو هورەیرەی هاوارکەر چۆن دەبینن؟ شەو و ڕۆژ ئێوە دروێنە دەکات، ئەی کوڕی ئەبو ماحوز، ئەی خراپەکاران، شەڕی من لەسەر چوارپێی تیژپێکەم چۆن دەبینن؟

کاتێك بارودۆخ بۆ خەواریج درێژەی کێشا، پیاوێك لەوان لەسەر ڕێگەی ئەبو هورەیرە دانیشت و بەشمشێر ڕەگی ملی بڕی و خستیە سەر زەوی. هاورێکانی هەڵیانگرت و دەرمانیان کرد تا چاکبویەوە و بەشێوەی ڕۆژی یەکەم دەهاتەدەر و شەڕی لەگەڵ ئەوان دەکرد.

دواتر خەواریج بۆ ماوەی یەك مانگ چاوەڕوانی ئەوانیان کرد تا خۆراکی خەڵکانی ئیسفەهان کۆتایی هات و بازنە گەمارۆ گوشاری زیاتری خستە سەر ئەوان و کەوتنە دژواریەوە. عەتاب بەوانی وت: ئەی خەڵکینە، ئەو ڕەنجە و ئازاری پێتان بڕاوە، بۆ ئێوە داباریوە. ئەوەندەی نەماوە یەك یەکی ئێوە لەسەر جێگا بمرن و براکانتان بێن و ئێوە بەخاك بسپێرن. دواتر ئەوان بمرن و کەسیان دەست نەکەوێت بەراستی نوێژیان لەسەر بخوێنێت و بەخاکیان بسپێرێت. سوێند بەخوا ئێوە نەکەمن و نە سوارە تیژپێکان کەم لەناو ئێوەدا دەژین. هێشتا کەژیان و توێشو و هێزتان هەیە، لەگەڵ ئێمە بۆ شەڕی ئەم خەڵکە ڕەوانە ببن پێش ئەوەی توانای جوڵەتان نەمێنێت. سوێند بەخوا هیوادارم ئەگەر بەراستی و دروستی شەڕیان لەگەڵ بکەن، بەسەر ئەواندا سەرکەون. ئیسفەهانیەکان ئامۆژگاری ئەویان لەگوێ گرت.

## کوژرانی کوڕی ماحوزو فەرمانڕەوایی قەتەری کوڕی فەجائە

کاتێك عەتاب یارانی بۆ شەڕ دژی خەواریج هاندا و ئەوان رازی بون، خەڵکی کۆکردەوە و فەرمانیدا خواردنی زۆری ئامادە کرد و دەرخواردیدان. ئەوسا لەکاتی بەرەبەیان کە خەواریج ئارام خەوتبون، لەگەڵ هاورێکانی خۆی هێرشی کردە سەریان. ئەوەندە شەڕیان کرد تا لەلەشکرگەکەی خۆیان دوریان خستنەوە و گەیشتە زوبەیر کوڕی ماحوز. زوبەیر لەگەڵ هاورێکانی شەڕیان کرد تا خۆی لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی کوژران. ئەزەرقیەکان پەیوەستی قەتەری کوڕی فەجائە بون و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. نازناوەکەی ئەبو نەعامەبو. عەتاب و سوپاکەی تالآنی زۆریان لەلەشکرگەکەی ئەوان دەستکەوت. قەتەری هات و لەلەشکرگەکەی کوڕی ماحوز جێگەی گرت. دواتر ئیسفەهانی بەجێهێشت و روی لەکرمان کرد و لەو سەرزەمینە مایەوە تا دەستەیەکی فراوان لەخەڵکان لەدەوری کۆبونەوە و سامانی زۆریان بەدەست هێنا و بەهێز بون. دواتر روی کردە ئیسفەهان و لەوێوە بۆ سەرزەمینی ئەهواز. لەوێ مایەوە و لەم کاتەدا حارس کوڕی ئەبی رەبیعە کارگوزاری مەصعەب کوڕی زوبەیر لەبەسرە بو. ئەو بۆ مەصعەب نامەی نوسی و لەچارەنوسی خەواریج ئاگاداری کردەوە و بیری خستەوە کە جگە لەموهەلیب کەس پیاوی ئەم گۆڕەپانە نیە. موهەلیب فەرمانداری موسڵ و جەزیرە بو. مەصعەب فەرمانی شەڕ لەگەڵ خەواریجی پێدا و ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری ئەخەعی رەوانەی موسڵ کرد. موهەلیب رۆشتە بەسرە وپیاوە شەڕکەرەکانی هەڵبژارد و روی لەخەواریج کرد. خەواریج روبەروی بونەوە و لەسولاف چاویان بەیەك کەوت. هەشت مانگ لەوێ شەڕیان کرد، بەشێوەیەکی سەرسەختانە کەهیچ کەس هاوشێوەی نەبینیوە.

## گەمارۆ خستنە سەر رەی

لەم ساڵەدا مەصعەب کوڕی زوبەیر فەرمانی بەعەتاب کوڕی وەرقا ی ریاحی فەرمانداری ئیسفەهاندا بەرەو رەی بەرێکەوێت و لەگەڵ خەڵکەکەی (چونکە هاوکاری خەواریجیان کردبو) شەڕ بکات. ئەوان لەبەرابەر یەزید کوڕی حارس کوڕی رویەم هاوکاری خەواریجیان و پارێزگاریان لەشارەکەیان کردبو. عەتاب بەرێکەویت و لەگەڵ ئەوان جەنگی دەست پێکرد. فەرماندارەکەیان فەرخان بو. عەتاب ئەوانی خستە تەنگانەوە و

شارەکەیانی بەزۆری شمشێر گرت و ئەوەی لەناو شارەکەدا بو، تالآنی کرد و دەستی بەسەر قەلآکانی ئەو ناوچەیەدا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا وشکەساڵی و قاتوقڕی لەناو شام بلآوبویەوە و خەڵکەکەی بەرادەیەك کەوتنە تەنگانەوە کە نەیانتوانی شەڕ بکەن.

## کوژرانی عوبەیدالله کوڕی حوڕ

هەروەها لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی حوڕی جوعفی کوژرا. ئەو لەروانگەی لەپێشی و شیاوی یەکێك لە هەڵبژێردراوەکانی خەڵکەکەی خۆی بو. کاتێك عوسمان کوژرا و لەنێوان عەلی و معاویە شەڕ دەستی پێکرد، بەرەو دەرباری معاویە بەڕێکەوت چونکە عوسمانی خۆش دەویست. ئەو و مالك کوڕی میسمەع شان بەشانی معاویە شەڕیان کرد. عوبەیدالله لای معاویە مایەوە. ئەو هاوسەرێکی لەکوفە بو. کاتێك بۆ ماوەیەکی زۆر لەشام مایەوە، برای ئەم ژنە ئەوی کردە هاوسەری پیاوێك بەناوی عێکرەمە کوڕی خەبیص. ئەم هەواڵە بەعوبەیدالله گەیشت. لەشامەوە بەڕێکەوت و سکالآی لەسەر عێکرەمە تۆمار کرد و داوەریان بردە لای عەلی. عەلی وتی: پشتیوانی دژومنەکەی ئێمەت کرد و سنورەکانت بەزاند. عوبەیدالله وتی: ئایا ئەم کارەی من ڕێگر دەبێت لەداوەری کردنی تۆ؟ عەلی وتی: نا. ئەو بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە و عەلی ژنەکەی بۆ گەڕاندەوە. ژنەکە دوگیان بو. عەلی ژنەکەی بەکەسێکی بڕواپێکراو سپارد تا منالّی بو و منالّەکەی دا بەعێکرەمە و ژنەکە بۆ عوبەیدالله. ئەو گەڕایەوە بۆ شام و لەوێ مایەوە تا عەلی کوژرا. کاتێك کوژرا، روی کردە کوفە بۆ لای براکانی و وتی: کەسم نەبینیوە گۆشەگیری سودی پێبەخشیبێت. ئێمە لەشام بوین و ئەمە بارودۆخی معاویە بو. ئەوان وتیان: ئێمەیش لەکوفە بوین و لەعەلی ئەمە و ئەوەمان پێبڕا.

لەسەر ئەم بنەمایە چاویان بەیەك کەوت.

کاتێك معاویە مرد و حسین کوڕی عەلی کوژرا، عوبەیدالله کوڕی حوڕ یەکێك لەسوپای کوشتارکەری حسین و بنەماڵەکەی نەبو (نە لەناو سوپاکەی یەزیددابو نە لەسوپاکەی حسین). ئەو وشیارانە مەبەستی ئەوەی کرد لایەنگری هیچ کام نەبێت. کاتێك حسین کوژرا، کوڕی زیاد بەدوای گەورەکانی کوفەدا گەڕا و عوبەیداللەی لەناو ئەواندا نەبینی. دوای چەند ڕۆژ رۆشتە لای کوڕی زیاد. کوڕی زیاد پرسی: کوڕی حوڕ لەکوێ بویت؟

وتی: نەخۆش بوم. وتی: نەخۆشی دڵ، یا نەخۆشی جەستە. وتی: دڵم، هیچ کات نەخۆش نەبوە و جەستەم، خوا منی بەخشی و چاکی کردمەوە. کوڕی زیاد وتی: درۆت کرد، تۆ لەگەڵ دوژمنەکانی ئێمەدا بویت. وتی: ئەگەر لەگەڵ ئەو دەبوم، شوێن و پێگەم ئاشکرا دەبو.

کوڕی زیاد ئەوی پشت گوێ خست. ئەو ڕۆشتەدەر و سوار ئەسپەکەی بو. دواتر کوڕی زیاد بەدوایدا گەڕا. وتیان: ئێستاکە سوار بو. کوڕی زیاد وتی: بیهێننە لای من. پاسەوانەکان بەدوایدا ڕۆشتن و وتیان: بگەڕێرەوە بۆ لای فەرماندار. وتی: لەمنەوە پێی بڵێن هیچ کات بەدڵخواز سەردانی ناکەم. دواتر غاریدا و روی کردە ماڵی ئەحمەد کوڕی زیادی تایی. هاوڕێکانی لەدەوری ئەو کۆبونەوە. دواتر هاتەدەر و بەرەو کەربەلا بەرێکەوت و ڕۆشتە شوێنی کوژرانی حسین و بنەماڵەکەی و داوای لێخۆشبونی بۆ هەموان کرد. لەوێوە بەرەو مەداین ڕەوانە بون و لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| یقول امیر غادر و ابن غادر | الا کنت قاتلت الحسین بن فاطمه |
| و نفسی علی خذلانه و اعتزاله | و بیعة هذا الناکث العهد لائمه |
| فیاندمی ان لا اکون نصرته | الا کل نفس لا تشدد نادمه |
| و انی لانی لم اکن من حماته | لذو حسرة ان لا تفارق لازمه |
| سقی الله ارواح الذین تبادروا | الی نسره سحا من الغیث دائمه |
| وقفت علی اجداثهم و محالهم | فکاد الحشا ینقض و العین ساجمه |
| لعمری لقد کانوا مصالیت فی الوغی | سراعا الی الهیجا حماة خضارمه |
| تاسوا علی نصر ابن بنت نبیهم | باسیافهم اسادغیل ضراغمة |
| فان یقتلوا فی کل نفس بقیة | علی الارض قد اضحت لذلم و اجمه |
| و ما ان رای الراؤون افضل منهم | لدی الموت سادات و زهر قماقمه |
| یقتلهم ظلما و یرجو ودادنا | فدع خطة لیست لنا بملائمه |
| لعمری لقد راغمتمونا بقتلهم | فکم ناقم منا علیکم و ناقمه |
| اهم مرارا ان اسیر بجحفل | الی فئة زاغت عن الحق ظالمه |
| فکفوا و الا زرتکم فی کتائب | اشد علیکم من زحوف الدیالمه |

یانی: فەرماندارێکی دەغەڵی دەغەڵ زادە بە من دەڵێت: بۆ شەڕت لەگەڵ حسین کوڕی

فاتیمە نەکرد؟ بەڵام کاری من پێچەوانەیە. من بۆیە رەنج دەبم کە بۆ هاوکاری حسینم نەکرد و لەهاورێیەتی ئەو خۆم بەدور گرت. ئەی هاوار! چ پەشیمان بونەوەیەکی گیانبڕە! بۆ هاوکاری حسینم نەکرد؟ بۆ دەستی بەیعەتم بەم پیاوە پەیمان شکێنە درێژ کرد؟ بەڵێ، هەر کەسێك سەختیەکان بەسەر خۆی نەسەپێنێت، ئەنجامی کارەکەی سەرکۆنە کردنی خۆی دەبێت. من لەبەرە ئەوەی لەپاسەوانەکانی ئەو نەبوم، سەراسەری ژیان بەداخێکی گەورەوە بەسەر دەبەم. خواوەند ببەخشێت گیانی ئەو جوامێرانەی هاوکاری ئەویان کرد، بارانێکی بەردەوام لەسەر گۆڕەکەیان ببارێت. من لەسەر گۆڕەکانی ئەوان مامەوە، ئەوەندەی نەمابو ناخم بتەقێت و لەت لەت بێت بەڵام فرمێسك لەچاوەکانم وەك باران دادەباری. بەگیانی خۆم، ئەوان پیاوانێکی بوێر و تێکۆشەر بۆ بەدیهێنانی نیازی کەسانیتر بون. بەشمشێرە دەرکێشراوەکان هاوکاری کوڕی پێغەمبەرەکەیان کرد، شێرانی دارستان بون، پیاوانێکی چاونەترس. ئەگەر ئەوانی کوشتار کرد و بنەماڵەکەیان خستە بەردەم تیژی شمشێر، لەهەر جەستەیەك، گیانێك هەیە، کە لەتاو تورەیی، لەناخاوتن بەیەکجاری ناتەوان بوە. بینەران، کەسانێکی باشتر لەوانیان نەبینیوە: لەکاتی مەرگ سەروەران بون، ئەستێرە درەوشاوەکان بون، گەورەزادە بەخشەرەکان بون. ئەوان کوشتار دەکات و دواتر بەدوای هاورێیەتی ئێمە دەگەرێت. ئەم ئەندێشەیە لەخۆت دور بخەرەوە چونکە لەگەڵ سرشتی ئێمە سازگار نیە. سوێند بەگیانی خۆم کە خەڵکانی ئێمەتان بەزۆر بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو ناچار کرد، ئێستا زۆرن ئەو ژن و پیاوانەی کینەی نەشیاو بۆ سڕینەوەی ئێوەیان لەدڵ گرتوە. بەردەوام هەوڵ دەدەم بەسوپایەکی گەورە هێرش بکەمە سەریان و ئەو کەسانە لەناو ببەم کە پشتیان کردۆتە راستی و دروستی. دەست لەئێمە هەڵبگرن و گەرنە بەدەستە شەڕکەرەکان هێرش دەکەمە سەر ئێوە کە لەدەیلەمیەکان بۆ سەر ئێوە سەختگیرتر بن.

کوڕی حوڕ لەکەنارەکانی فوڕات نیشتەجێ بو تا یەزید مرد و شۆڕش لەهەمو شوێنەکان دەستی پێکرد و ئاگرەکەی هەمو ناوچەکانی گرتەوە. وتی: قورەیشیەکان دادپەروەریان نەکرد. منداڵە ئازادەکان لەکوێن؟ هەمو ئەو کەسانەی لەخەڵکەکەی خۆیان دورخرابونەوە، لەدەوری ئەو کۆبونەوە.

ئەو بەرەو مەداین بەرێکەوت و هەر سامانێك بۆ پاشا رەوانە دەکرا، بەشی خۆی و

هاورێکانی هەڵدەگرت و بۆ راسپێردراوانی ئەم کارە کاغەزێکی وەك بەڵگە دەنوسی. دواتر بەشارەکاندا گەڕا بەلاّم زیانی بەماڵ و منالّ و ئەمان بەخشراوەکان نەگەیاند. بەم شێوەبو تا موختار دەرکەوت و لەکارەکانی عوبەیدالله ئاگادار بویەوە. هاوسەرەکەی گرت و خستیە زیندان. عوبەیدالله لەگەڵ هاورێکانی خۆی هێرشی کردە سەر زیندانی کوفە و درگای زیندانەکەی شکاند و هەمو ژنەکانی ئازاد کرد و وتی:

| | |
|---|---|
| الم تعلمی یا ام توبة اننی | انا الفارس الحامی حقائق مذحج |
| و انی صبحت السجن فی سورة الضجی | بکل فتی حامی الذمار مدجج |
| فما ان برحنا السجن حتی بدالنا | جبین کقرن الشمس غیر مشنج |
| و خد اسیل عن فتاة حبیبة | الینا سقاها کل دان مشجج |
| فما العیش الا ان ازورك امنا | کعادتنا من قبل حربی و مخرجی |
| و مازلت محبوسا لحبسك و اجما | و انی بما تلقین من بعده شجی |

یانی: ئەی دایکی تۆبە، ئایا نەتزانیوە کە من ئەو سوارکارەم کە لەناو ونیشان و بنەماڵە و سامانی خەڵکانی مەزحەج پارێزگاری دەکەم؟ من لەگەرمترین کاتی رۆژ هێرشم کردە سەر زیندان و گەنجە ئامادەکان بۆ بەرگری و داپۆشراو بەکەرەستەی شەڕ، هاورێیەتیان دەکردم. هێشتا زۆر لەزیندانی شار دورنەکەوتبومەوە کە ناوچاوێکی درەخشان وەك خۆرێك تیشکی بەسەر ئێمەدا پرژاند و روخساری نەرم و تەخت لەکچێکی خۆشەویست لەنزیك ئێمە کە هەورە نزیکەکان ئەویان تازە و شادان کرد. ژیان جگە لەمە شتێك نیە کە بەدڵێکی ئارام و ئاسودە بێمە لای تۆ و بتبینم و ئەمە هەمان شێوەیە کە پێش گرفتاربونی من بەجەنگ و دەرچونم لەشارەکان، عادەتم پێگرتبو. من بەدوای زیندانی بونی تۆ، زیندانی کرام و بەردەوام داخم دەخوارد و لەوەی دواتر بەسەرتۆدا بێت، نیگەران و خەمبارم.

ئەمە قەسیدەیەکی دورودرێژە.

ئەو بەردەوام ئاژاوە و تەگەرەی لەکاروباری کارگوزارەکانی موختار دروست دەکرد. لەبەر ئەمە، ماڵەکەیان لەهەمەدان سوتاند وسامانەکەیان تالآن کرد. عوبەیدالله روی کردە سەرزەمینەکانی هەمەدان و ئەو ناوچانەی تالآن کرد. ئەو دەڕۆشتە ناو شارەکان و هێرشی دەکردە سەر کارگوزارەکان و سامانەکانی لێ دەسەندن و دواتر رێگەی کێوی

دەگرتەبەر. بەم شێوەبو تا موختار کوژرا.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو بۆ ماوەیەك خۆڕاگری لەبەرابەر موختار کرد و دواتر بەیعەتی لەگەڵ کرد. موختار مەبەستی ئەوەی کرد زیانی لێ بدات بەڵام لەبەر ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر لەم کارە چاوی پۆشی. دواتر لەگەڵ کوڕی ئەشتەر ڕۆشتە موسڵ بەڵام لەگەڵ ئەو بەشداری لەشەڕ دژی کوڕی زیاد نەکرد بەڵکو خۆی نەخۆش خست. لەگەڵ کوڕی ئەشتەریش نەسازا و لێی جیابویەوە و هاوڕێ لەگەڵ سێسەد پیاوی شەڕکەر روی کردە ئەنبار و تالانی کرد و سامانەکانی گەنجینەی هەڵگرت. کاتێك ئەم کارەی کرد موختار فەرمانیدا و ماڵەکەیان وێران کرد و ژنەکەیان خستە زیندانەوە. دواتر ئەوە رویدا کەئاماژەمان پێدا. هاوڕێیەتی مەصعەبی کرد و دژی موختار شەڕی کرد و بو بەشایەتی کوژرانی ئەو. کاتێك موختار کوژرا، خەڵك لەدوەم دەوری فەرمانڕەوایەتی مەصعەب ئاگاداریان کردەوە کە لەزیانی کوڕی حوڕ بۆ سەر سواد ئاسودە نین چونکە ئەم کارەیشی لەگەڵ موختار کرد.

مەصعەب ئەوی خستە زیندان و لەزیندانەدا وتی:

| | |
|---|---|
| فمن مبلغ الفتیان ان اخاهم | اتی دونه باب شدید و حاجبه |
| بمنزلة ما کان یرضی بمثلها | اذا قام عنته کبول تجاذبه |
| علی الساق فوق الکعب اسود صامت | شدید یدانی خطوه و یقاربه |
| و ما کان ذا من عظمجرم جرمته | و لکن سعی الساعی بما هو کاذبه |
| و قد کان فی الارض العریضة مسلك | و ای امری ضاقت علیه مذاهبه |

یانی: کێیە لەمنەوە پەیامێك بۆ گەنجەکانی هۆزەکەم ببات؟ دەبێت بەوان بڵێت کەبراکەیان گرفتاری دیوارێکی ئەستورە و گەورەیە کەپاسەوانەکان بەردەوام پارێزگاری لێدەکەن. لەشوێنێك کەهەرگیز هاوشێوەی ئەوەی پەسەند نەکردوە. کاتێك هەستێت، زنجیر وبەندەکان زەختی لێدەکەن و بەزەویدا دایدەکوتن. لەسەرەوەی قولاپەی پێ، زنجیرێکی رەق و رەش و بێ جوڵە، بەشێوەیەك هەنگاوەکانی لەیەك نزیك دەکاتەوە. ئەمە نە بەتاوانی گوناحێك دەچێژم کەئەنجامم دابێت، هەرچی هەیە، هەواڵی درۆی دوزمانەکانە کەهەڵیان بەستوە. لەزەوی پان و بەرینی خواوەند زۆر رێگا بەروی مندا کراوە بو. کام پیاوە خاوەن بڕیارەیە رێگە بۆ ئەو تەنگ بێت و جیهان زەختی لێ بکات.

هەروەها وتی:

بای بلاء ام بائة نعمة　　　　تقدم قبلی مسلم و المهلب؟

یانی: پێش من موسلیم یا موهەلیب لەترسی کام ئەزمون یا هیوا بەکام بەخشش، هەنگاویان بردە پێش؟

مەبەستی موسلیم کوڕی عومەر باوکی قوتەیبە کوڕی موسلیم و موهەلیب کوڕی ئەبی صوفرە بو.

عوبەیدالله لەناو زیندانەوە لەگەڵ چەند کەسێك لەگەورەکانی میزحەج گفتوگۆی کرد تا لای مەصعەب نێوەنجیگەری بۆ بکەن. کەسی بۆ لای گەنجەکانی مێزحەج رەوانە کرد و وتی: کەرەستەی شەڕ ئامادە بکەن و لەژێر جل و بەرگەوە بیشارنەوە. ئەگەر مەصعەب بەنێوەنجیگەری رازی بو، زیان لەهیچ کەسێك مەدەن و ئەگەر هاتنەدەر و وایان نیشاندا بەو کارە رازی نەبوە، بەرەو زیندان وەرن و من لەناوەوە هاوکاریتان دەکەم.

کاتێك ئەو چەند کەسە نێوەنجیگەریان کرد، مەصعەب بەداواکەیان رازی بو و عوبەیدالڵەی ئازاد کرد. ئەو ڕۆشتە ماڵەکەی خۆی و خەڵك بەردەوام دەهاتن و پیرۆزباییان لێدەکرد. عوبەیدالله وتی: ئەنجامی ئەم کارە بەرەو باش بون ناڕوات مەگەر بەوەی سەرەتاکەی بەرەو باش بون برد. دەبێت کەسانێکی وەك چوار خەلیفەکەی پێشو بێنە سەر کار. ئێمە لەناو فەرمانڕەواکانی ئێستای خۆمان کەسی هاوشێوەی ئەوانمان نەبینیوە تا کاروبارەکانی خۆمان بەوان بسپێرین. ئەگەر کاروبار لەسەر ئەم بنەمایە هەڵسوڕێت کەهەر کەس زۆردار بێت، فەرمانڕەوایەتی بکات، بۆ بەیعەتی کەسێك بخەینە ئەستۆی خۆمان. نە ئازاترن لەئێمە و نە کەسانی زیاتریان بۆ پارێزگاری کردن لەخۆیان هەیە. پێغەمبەری خوا وتویەتی: فەرمان بردن لەئافرێنراوەکان بەبەهای نافەرمانی کردنی خواوەند، ڕەوا نیە. هەمویان گوناحکار و نافەرمانی خواوەند و بەهێزی ئەم دنیا و بەدبەختی ئەو دنیان. ئەی بۆ ڕێزی ئێمە دەدرن و ئابروی ئێمە پێشێل دەکەن؟ مەگەر ئێمە سەرکەوتوانی قادسیە و نەهاوەند و جەلەولا و نوخەیلە نین؟ ناوچاوی خۆمان کردە قەڵغانی ڕمەکان و روخساری خۆمان بۆ نیشانەی شمشێرەکان. ئێستا نەمافەکانی ئێمە دەناسن نە لەپێشی ئێمە، بۆ؟ لەبارەگای خۆتان پارێزگاری بکەن

چونکە من لەبەرابەر ئەوان ڕێگەی ناسازگاری دەگرمەبەر و دوژمنایەتی خۆم ئاشکرا دەکەم و هیچ هێز و توانایەك جگە لەهێزی خوا نیە. ئەو لەکوفە ڕۆشتەدەر و جەنگی دژی ئەوان دەست پێکرد و بەردەوام هێرشی دەبرد و تالآنی دەکرد.

مەصعەب، سەیف کوڕی هانی موڕادی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. هانی باجی (بادوریای) و شوێنەکانیتری پێ پێشنیاری کرد بەو مەرجەی بێت و فەرمان وەربگرێت. بەم پێشنیارە ڕازی نەبو. مەصعەب، ئەبرەد کوڕی قورەی ڕیاحی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد کە شەڕی لەگەڵ دەست پێکرد. عوبەیداللە هێزەکەی ئەوی تێکشکاند و ڕوخساری قەڵشاند. دوبارە حورەیس کوڕی یەزیدی ڕەوانە کرد کە عوبەیداللە ئەوی کوشت. دوای ئەو حەجاج کوڕی جاریەی خەسعەمی و موسلیم کوڕی عەمرۆی ڕەوانە کرد کە لەکەنارەکانی ڕوباری صەرصەر ڕوبەڕوی بونەوە. عوبەیداللە لەگەڵ هەردوکیشان شەڕی کرد و هەردوکیانی تێکشکاند. مەصعەب بەناچاری کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد و پێشنیاری ئەمان و پاداشتی پێکرد و وتی: لەسەر هەرسەرزەمین یا ناوچەیەك کە بتەوێت، دەتکەمە فەرمانڕەوا. عوبەیداللە ڕازی نەبو. ئەو ڕۆشتە نێرسی کە دێدارەکە هەلآت و سامانەکەی فەلوجەی لەگەڵ خۆی برد. عوبەیداللە شوێنی کەوت تا گەیشتە عەین تمر (سەرچاوەی خورما) کە فەرماندارەکەی بەستام کوڕی مەسقەلە کوڕی هوبەیرەی شەیبانی بو. دێدارەکەی پەنای بۆ برد و ئەوان هاتنەدەر و شەڕیان لەگەڵ عوبەیداللە ئەزمون کرد. لەم کاتەدا حەجاج کوڕی جاریەی خەسعەمی گەیشت و هێرشی کردەسەر عوبەیداللە. عوبەیداللە ئەو و بەستام و دەستەیەکی زۆری لەخەڵکان بەئەسیری گرت. کەسانێك لەیارانی خۆی بۆ لای دێدارەکە ڕەوانە کرد و سامانەکەی لێ سەندەوە و ئەسیرەکانی ئازاد کرد.

دواتر عوبەیداللە هاتە تکریت و دەستی بە کۆکردنەوەی باج کرد. مەصعەب، ئەبرەد کوڕی قورەی ڕیاحی و جەون کوڕی کەعبی هاوری لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد. موهەلیب پێنسەد پیاوی شەڕکەری بەسەرکردایەتی یەزید کوڕی موغفەل بۆ هاوکاری ئەو دوانە نارد. یەکێك لەپیاوەکانی عوبەیداللە پێی وت: سوپایەکی گەورە هاتۆتە سەر تۆ، شەڕ لەگەڵ ئەوان مەکە. عوبەیداللە وتی:

یخوفنی بالقتل قومی و انما     اموت اڑا جاو الکتاب الموجل

لعل القنا یدنی باگرافها الغنی　　فنحیا کراما او نکر فنقتل

الم تر ان الفقر یزری باهله　　و ان الغنی فیه العلی و التجمل

و انك ان لا ترکب الهول لا تنل　　من المال ما یرجی الصدیق و یفجل

یانی: خەڵکەکەی من، من لەکوژران دەترسێنن بەڵام تەنیا کاتێك دەمرم کە نوسراوێکی بەرواردار بگات. دەبێت ڕمەکان بەنوکەکانی خۆیان، مەبەستەکان بەدی بێنن و دواتر هاوشێوەی گەورەکان ژیان بەسەر ببەین یا هێرش بکەین و بکوژرێین. نازانیت کەنەداری دەبێتە هۆکاری ریسوایی نەدار؟ نازانیت کە بەتوانایی، بۆ بەتوانا سەروەری رازاوە بەخەڵات بەرهەم دێنێت؟ وتۆ ئەگەر روبەروی زیانەکان نەبیتەوە، ئەو ئەندازە لەدارایی بەدەست ناهێنیت کە بۆ هاورێکان بەس بێت و لێیان زیاد بێت.

عوبەیدالله لەگەڵ سێسەد پیاوی شەڕکەر بۆ ماوەی دو ڕۆژ شەڕی لەگەڵ کردن. کاتێك شەو داهات، هەردولا لەیەك جیابونەوە. عوبەیدالله لەتکریتەوە هات و بەهاورێکانی خۆی وت: دەمەوێت ئێوە بۆ لای عەبدولمەلیك کوڕی مەروان ببەم، ئامادە بن. دوبارە وتی: دەترسم بمرم پێش ئەوەی دڵی مەصعەب و هاورێکانیم لێوانلێو لەخوێن کردبێت. ئەو ڕۆشتە کوفە و لەسەر رێگەی خۆی گەیشتە کەسکەر و سامانی گەنجینەی هەڵگرت. دواتر درێژەی بەرێگەکەی دا و لەحەمام جەریر دابەزی. مەصعەب، عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەری بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد. عوبەیدالله شەڕی لەگەڵ کرد و ژمارەیەکی زۆر لەهاورێیانی ئەوی کوشت. دوبارە مەصعەب، حەجار کوڕی ئەعومری بۆ روبەروبونەوەی ئەو رەوانە کرد. حەجار شکستی خوارد و مەصعەب جوێنی پێدا. دواتر مەصعەب، جەون کوڕی کەعبی هەمەدانی و عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەری پەیوەستی سوپاکەی ئەو کرد. ئەوان هەمویان هێرشیان کردە سەری. بریندارەکان لەناو سوپاکەی عوبەیدالله رو لەزیاد بون بو و ئەسپەکانیان لەناوچون. حەجار شکستی خوارد و دواتر گەڕایەوە و شەرێکی زۆر قورسی دەست پێکرد. شەڕ تا شەو درێژەی کێشا. کوڕی حوڕ لەکوفە ڕۆشتەدەر.

مەصعەب بۆ یەزید کوڕی حارس کوڕی رویەمی شەیبانی کە لەمەداین بو، نامەی نوسی و فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ عوبەیدالله کوڕی حوڕ بکات. ئەو کورەکەی حەوشب کوڕی یەزیدی وەك پێشەنگ رەوانە کرد. عوبەیدالله لەباجسەری روبەروی بویەوە و شکستیدا

و هاورێکانی کوشتار کرد. کوڕی حوڕ ڕێگەی مەدایینی گرتەبەر کەخەڵکەکەی لەترسا خۆیان داشارد. عوبەیدالله هاتەدەر. مەصعەب، جەون کوڕی کەعبی هەمەدانی و بشر کوڕی عەبدالله ئەسەدی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد. جەون لە حەولایا دابەزی و بشر بەرەو تامەڕا پێشڕەوی کرد. عوبەیدالله ئەوی کوشت و سوپاکەی کوشتار کرد. دواتر لەحەولایا ڕوبەڕوی جەون کوڕی کەعب بویەوە. عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله ڕوبەڕوی بویەوە کە عوبەیدالله ئەویشی کوشت و هێزەکانی شکست پێهێنا. دوبارە بەشیر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی بەشیری عیجلی ڕوبەڕوی بویەوە کە عوبەیدالله لە سوراء شەڕی لەگەڵ ئەو ئەزمون کرد و بەشیر پاشەکشێی کرد. کوڕی حوڕ لەسواد مایەوە و دەستی بەکۆکردنەوەی باج کرد.

دواتر پەیوەستی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان بو. کاتێك ڕۆشتە لای، ڕێزی لێگرت و لای خۆی لەسەر تەخت داینیشاند و سەد هەزار درەمی پێ بەخشی و سامانەکەی لەنێوان خۆی و هاورێکانی دابەش کرد. کوڕی حوڕ پێشنیاری پێکرد سوپایەکی لەگەڵ ڕەوانە بکات تا بەهاوکاری ئەو سوپایە شەڕ لەگەڵ مەصعەب بکات. عەبدولمەلیك پێی وت: لەگەڵ هاورێکانی خۆت بەرێکەوە و هەر کەسێك بینی، کۆیبکەرەوە و منیش شەڕکەران بۆ هاوکاری تۆ ڕەوانە دەکەم.

عوبەیدالله لەگەڵ هاورێکانی خۆی بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەگوندێك لەنزیك ئەنبار دابەزی. هاورێکانی داوای فەرمانیان لێکرد تا بڕۆنە ناو کوفە. ئەو فەرمانی پێدان و پێی وتن هاورێکانی ئاگادار بکەنەوە کە گەیشتوە تا هەمویان لەدەوری کۆببنەوە. هەواڵی ئەم کارە بەخەڵکانی قەیس گەیشت. ئەوان لای حارس کوڕی ئەبی ڕەبیعە (کارگوزاری کوڕی زوبەیر لەکوفە) کۆبونەوە و داوایان لێکرد سوپایەکیان لەگەڵ ڕەوانە بکات تا شەڕی عوبەیدالله بکەن و ئەم کاتە کە هاورێکانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکردوە، بقۆزنەوە. ئەو سوپایەکی گەورەی لەگەڵ ئەوان ڕەوانە کرد کە شەڕکەران بەرێکەوتن و ڕوبەڕوی عوبەیدالله بونەوە. کوڕی حوڕ بەیارانی وت: ئێمە دەستەیەکی کەمین و توانای خۆڕاگریمان لەبەرابەر ئەو سوپا گەورەیە نیە. دوبارە وتی: من ئەو کەسە نیم دەستبەرداری ئەوان ببم. هێرشی کرد و وتی:

یا لك یوما فات فیه نهبی       و غاب عنی ثقتی و صحبی

یانی: هاوار چەند رۆژێکی بەئازارە کە تاڵان کردنی منی تیا کۆتایی دێت و هاوەڵ و هاورێیانم لەدەوری من بڵاوەیان کردوە.

دواتر هێرشیان کردەسەری و ریزی هاورێکانی ئەویان تێکشکاند و هەوڵیان دا بەئەسیری بیگرن بەڵام نەیانتوانی. ئەو فەرمانی بەهاورێکانیدا شوێن کاری خۆیان بکەون. ئەوان رۆشتن و کەس رێگەی لێ نەگرتن. عوبەیدالله بەتاقی تەنیا هێرشی کردە سەر ئەو سوپا گەورەیە و شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد. لەم کاتەدا پیاوێك بەناوی ئەبو کەدیە پەلاماریدا و رمێکی لێدا. ئەویان تیرباران کرد و دەستە دەستە هێرشیان دەکردەسەر بەڵام لەنزیك بونەوە لەو خۆیان بەدور دەگرت. دەیوت: ئەمانە تیر و زوبینە یا تەشی؟ کاتێك برینەکانی سەر جەستەی فراوان بون، رۆشتە سەر رێگایەك بەڵام ئەسپەکەی هاورێیەتی نەکرد. سوار کەشتی بو و کەشتیوان ئەوی بردە ناوەراستی روباری فورات. سوارەکان شوێنی کەوتن و بەونبتیەکانی ناو کەشتیەکەیان وت: ئەو کەسەی سەروەری باوەڕداران داوای دەکات، لەناو کەشتیەکەدایە، ئەگەر لەدەستی ئێوە رابکات، کوشتارتان دەکەین. کوڕی حوڕ هەستا و خۆی فرێدایە ناو ئاوەکە. پیاوێکی گەورەی زەبەلاح هەستا و دەستی ئەوی بەبەهێزی گرت. خوێن لەبرینەکانی فیچقەی دەکرد. کاتێك بینی بۆ لای خەڵکانی قەیسی دەبەن، دەستی ئەو کەسەی گرت کە دەستی گرتبو و خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە و هەردوکیان خنکان.

سەبارەت بەکوژرانی ناماژەیان بەگێڕانەوەیەکیتریش داوە بەمشێوەیە: ئەو رۆژگارێك هاتوچۆی مەصعەب کوڕی زوبەیری دەکرد. بینی کەزیاتر رێز لەکەسانیتر دەگرێت. بۆ عەبدالله کوڕی زوبەیر نامەی نوسی و سەرکۆنەی مەصعەبی کرد و هەڕەشەی ئەوی کرد کەپەیوەستی کوڕی مەروان دەبێت. قەسیدەیەکی هۆنیەوە و رەوانەی کرد. لەقەسیدەکەدا وتی:

| | |
|---|---|
| ابلغى امير المومنين رسالة | فلست على راى قبيح اواربه |
| افى الحق ان اجفى و يجعل مصعب | وزيرا له من كنت فيه احاربه |
| فكيف و قد اتيتكم حق بيعتى | و حقى يلوى عندكم و اطالبه |
| و ابليتكم ما لا يضيع مثله | و اسيتكم و الامر صعب مراتبه |
| فلما استتار الملك و انقادت العدى | و ادرك من ملك العراق رغائبه |

جفا مصعب عنی و لو کان غیرة — لا صبح فیما بیننا لا اعایبه
لقد رابنی من مصعب ان مصعبا — اری کل ذی غش لناهو صاحبه
و ما انا ان حلا تمونی بوارد — علی کدر قد غص بالماء شاربه
و ما لامری الا لذی الله سائق — الیه و ما قد خط فی الزبر کاتبه
اذا قمت عند الباب ادخل مسلما — و یمنعی ان ادخل الباب حاجبه

یانی: پەیمانێك لەمنەوە بەسەرومری باوەڕداران بگەیێنە چونکە من لەدڵدا ئەندێشەیەکی ناڕاستم بەرابەر بەو نیە تا بیشارمەوە. ئایا راستە من دوربخەنەوە و مەصعەب کەسێك بکاتە وەزیری خۆی کە من لەرێگەی ئەو شەرم لەگەڵ کردوە؟ چۆن دەبێت من ماق بەیعەت کردن لەگەڵ ئێوە بەجێ بێنم و ئێوە مافەکانم لەمن درێغ بکەن و من بەردەوام خوازیاری بم. ئەوەندە لەرێگەی ئێوە رەنجم برد کە هاوشێوەی رەنجەکەی من پشت گوێ ناخەن، کاتێك دژواری و گرفتاریەکان لەئارادابون، من لەرێگەی ئێوە گیانم دەبەخشی. کاتێك فەرمانڕەوایی ئاشکرابو و روی لەئارامی کرد و مەبەستەکانی ولاتی عێراق کەوتنە بەردەستی من، مەصعەب گومانی لا دروست کردم چونکە دەبینم هەر کەس لەرابردو دوژمن و نەیاری ئەو بوە، ئێستاکە هاورێیەتی. ئێوە هەرچەندە من لەمە دوربکەنەوە، لەسەر کانیە لێڵەکان دانابەزم کە ئاوەکەی قوڕگم بگرێت. هەر پیاوێك تەنیا ئەوەی بەسەر دێت کە خوا بۆی دیاری دەکات و بەو ئاراستەی دەبات، هەمان کەنوسەر لەنوسراوەکەی خۆی تۆماری کردوە. کاتێك لەبەردەرگای کۆشك بێستم و ئاشتی خواز یا موسوڵمان بم، دەرگاوان من دەردەکات و رێگەی چونە ژورەوەم پێ نادات.

مەصعەب ئەوی خستە زیندان. ئەوچەندین سکاڵای لەو کردوە کە لەناو زیندانەوە رەوانەی کردوە. بەڵێ ئەو قەسیدەیەکی هۆنیەوە و خەڵکی قەیسی عەیلانی سەرکۆنەکرد. یەکێك لەبەیتەکانی ئەمەبو:

الم تر قیسا قیس عیلان برقعت — لحاها و باعث نبلها بالمغازل

یانی: ئایا خەڵکی قەیسی عەیلانت نەبینی کە لەچکەکانیان لەسەر ریشی خۆیانەوە پۆشیوە و تیر و زوبینیان لەگەڵ تەشیەکان مامڵە پێکرد؟

زەفەر کوڕی حارسی کەلابی پەیامی بۆ مەصعەب رەوانە کرد کە: من قورسایی گرانی

شەڕ لەگەڵ کوڕی زنی چاوەڕەش (عەبدولمەلیك )م لەسەر شانی تۆ هەڵگرت و ئێستا ئەوە کوڕی حوڕە بەمشێوە خراپە سەرکۆنەی قەیسیەکان دەکات. دواتر چەند کەسێك لەبەنی سەلیم، عوبەیداللەیان دەستگیر کرد. ئەو وتی، من وتومە:

الم تر قيسا قيس عيلان اقبلت          و سارت الينا بالقنا و القنابل

یانی: ئایا نەتبینی خەڵکی قەیسی عەیلان هاتنەدەر و رویان لەئێمە کرد و تۆپی ئاگرین و کۆمەڵێکی زۆر زوبینیان پێبو؟

پیاوێك لەناو ئەوان بەناوی عەیاش ئەوی کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

دەڵێن: لەم ساڵەدا چوار ئاڵا گەیشتە عەرەفات: یەکێك ئاڵای کوڕی حەنیفە و هاوڕێکانی، یەکێك ئاڵای کوڕی زوبەیر و شوێنکەوتەکانی، ئاڵایەکی ئومەوییەکان و چوارەم ئاڵای نەجدە حروری. لەناو ئەوان نە شەڕ رویدا نەئاژاوە. هاوڕێکانی محەممەد کوڕی حەنیفە لەهەموان ئارامتر بون.

کارگوزاری کوڕی زوبەیر لەمەککە لەم ساڵەدا جابر کوڕی ئەسوەد کوڕی عەوف زوهری بو، لەبەسرە و کوفە مەصعەب کوڕی زوبەیر، لەسەر دامەزراوەی دادی کوفە عەبداللە کوڕی عوتبە کوڕی مەسعود، لەسەر دامەزراوەی دادی بەسرە هشام کوڕی هوبەیرە، فەرمانداری خوراسان عەبداللە کوڕی خازم و فەرمانڕەوای شام عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کە رێگەی ناسازگاری لەگەڵ کوڕی زوبەیری گرتەبەر.

ئەم کەسانە مردن: عەبداللە کوڕی عەباس لەساڵی ٦٨/ ٦٨٨ زایینی لەتەمەنی ٧٤ ساڵی، عودەی کوڕی حاتەم کە دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٦/ ٦٨٦ زایینی مرد و لەم کاتەدا ١٢٠ ساڵ تەمەنی بو، ئەبو واقد حارس کوڕی مالکی لەیسی، ئەبو شورەیح خومیلد کوڕی عەمرۆ کەعبی خوزاعی، عەبدولرەحمان کوڕی حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعە کەدەستەیەك دەڵێن: لەرۆژگاری پێغەمبەر لەدایك بو.

## روداوەکانی ساڵی شەست و نۆی کۆچی ( ٦٨٨- ٦٨٩ زایینی )

### کوژرانی عەمرۆ کوڕی سەعیدی ئەشدەق

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی سەعیدی ئەشدەق ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ عەبدولمەلیك کوڕی مەروان گرتەبەر و دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت و کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: ئەم روداوە لەساڵی ٧٠/ ٦٨٩ زایینی رویدا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە عەبدولمەلیك کوڕی مەروان دوای گەڕانەوە لە قێنسرین بۆ رۆژگارێکی درێژ لەدیمەشق مایەوە. دواتر بەرێکەوت و مەبەستی قرقیسیای کرد کە زەفەر کوڕی حارسی کەلابی فەرمانڕەوایەتی دەکرد. عەمرۆ کوڕی سەعید هاورێی عەبدولمەلیك بو. کاتێك گەیشتنە شوێنێك بەناوی بوتنان حەبیب، عەمرۆ شەوانە لەگەڵ حەمید کوڕی حورەیسی کەلبی و زوهەیر کوڕی ئەبرەدی کەلبی بۆ دیمەشق گەڕایەوە کە فەرماندارەکەی عەبدولرەحمان کوڕی دایکی حەکەمی سەقەفی وەك جێگری عەبدولمەلیك بو. کاتێك بیستی، عەمرۆ هاتوە، هەڵات. عەمرۆ ڕۆشتە ناو شارەکە و دەستی بەسەردا گرت و گەنجینەی تالآن کرد و ماڵی کوڕی دایکی حەکەمی خاپور کرد. خەڵك لەدەوری ئەو کۆبونەوە. ئەو قسەی بۆخەڵك کرد و هیوای و مزگێنی زۆری پێ بەخشین.

عەبدولمەلیك شەوی کردە بەیانی و جێگەی عەمرۆ کوڕی سەعیدی بەچۆڵ بینی. هەواڵی کاری عەمرۆیان پێدا. ئەو بۆ دیمەشق گەڕایەوە و بۆ چەندین رۆژ شەڕی لەگەڵ کرد. هەرجار کەعەمرۆ حەمید کوڕی حورەیسی وەك فەرماندەی سوارەکان رەوانە دەکرد، عەبدولمەلیك بۆ روبەروبونەوە سوفیان کوڕی ئەبرەدی کەلبی رەوانە دەکرد. هەرجار کە زوهەیر کوڕی ئەبرەدی رەوانە دەکرد، ئەو حەسان کوڕی مالك کوڕی بەحدەلی بۆ روبەروبونەوە رەوانە دەکرد.

دواتر عەبدولمەلیك و عەمرۆ ئاشتیان کرد و لەنێوان خۆیان پەیمان نامەیەکی ئاشتیان نوسی. عەبدولمەلیك ئەمانی پێدا. عەمرۆ لەگەڵ سوارەکانی خۆی بۆ لای عەبدولمەلیك ڕۆیشت. ئەوەندە ڕۆشتە پێش کە بەسمی ئەسپەکانی خۆیان تەناف خێوەتەکەی عەبدولمەلیکیان پێشێل کرد و خێوەتەکە کەوت و ئەو ڕۆشتە لای عەبدولمەلیك .

عەبدولەلیك لەرۆژی پێنج شەممە ڕۆشتە ناو دیمەشق. کاتێك چوار ڕۆژ بەسەر هاتنی عەبدولەلیك تێپەڕی کرد، کەسی بۆ لای عەمرۆ ڕەوانە کرد و پەیامیداکە وەرە بۆ لای من. عەبدولەلیك سەبارەت بەکوشتنی عەمرۆ لەگەڵ کەریب کوڕی ئەبرەهەی حەمیری راوێژی کرد. وتی: من لەم کارەدا هیچ وشترێکی نێر یا مێچکەم پێ نابڕێت، کارێکی لەم شێوە دەتوانێت بەلەناوچونی گشتی هۆزی گەورەی حەمیر کۆتایی بێت.

کاتێك نێردراو گەیشتە لای عەمرۆ و پەیامی گەیاند، عەبدالله کوڕی یەزید کوڕی معاویەی لای ئەو بینی. ئەو بەعەمرۆی وت: ئەی باوکی ئومەییە، تۆ لای من لەچاو و گوێم ڕێزدارتریت، بەباشی دەزانم نەڕۆیتە لای عەبدولەلیك. عەمرۆ پرسی: بۆ؟ عەبدالله وتی: چونکە تەبیع کوڕی کەعب الاخبار وتویەتی: گەورەیەك لەمناڵەکانی ئیسماعیل دەگەڕێتەوە و دەروازەکانی دیمەشق دەبەستێت و دواتر دەرواتەدەر و زۆری پێ ناچێت لەناو دەچێت و دەکوژرێت. عەمرۆ وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خەوتبێتم، عەبدولەلیك بوێری ئەوەی نیە لەخەو هەڵمسێنێت، بوێری ئەوەی نیە دەستدرێژی بکاتە سەر من. من دوێ شەو عوسمانم لەخەودا بینی کە کراسکەی خۆی دەکردە بەرمن.

عەبدالله کوڕی یەزید زاوای عەمرۆ بو. دواتر عەمرۆ بەنێردراوی وت: ئەمشەو دێم.

کاتێك ئێوارێ داهات، عەمرۆ زرێی لەبەر کرد و شمشێری بەست. حەمید کوڕی حورەیسی کەلبی لای ئەو بو. کاتێك هەستا، قاچی لەفەرشە گیری کرد و ئەوەندەی نەمابو بکەوێت. حەمید پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر بەقسەی من بکەیت، ناڕۆیت. هاوسەرەکەی لەخەڵکی کەلب، ئەم قسەی دوبارە کردەوە. عەمرۆ گوێی پێنەدان و لەگەڵ سەد کەس لەکۆیلەکانی خۆی بەرێکەوت.

عەبدولەلیك بەنی مەروانی لەدەروی خۆی کۆکردەوە، کاتێك گەیشتە بەردەم دەرگای کۆشك، فەرمانی چونە ژورەوەیان پێدا. ڕۆشتە ژوور. لەهەر دەرگایەك کەدەڕۆشتە ژوور، ڕێگەیان لەدەستەیەك لەهاورێکانی دەگرت و لەویان جیا دەکردەوە. کاتێك گەیشتە لای عەبدولەلیك ، تەنیا نۆکەرەکەی لەگەڵی مایەوە. عەمرۆ سەیری عەبدولەلیکی کرد و بینی بەنی مەروان و حەسان کوڕی بەحدەلی کەلبی و قەبیسە کوڕی زوەیبی خوزاعی لای ئەو دانیشتون. کاتێك کۆبونەوکەی ئەوانی بینی، هەستی بەزیان کرد. روی کردە نۆکەرەکەی خۆی و وتی: بڕۆ لای براکەم یەحیا و بڵێ بێت بۆ لای من. نۆکەر لەوتەکەی

تێنەگەیشت و وتی: بەڵێ! عەمرۆ وتی: ون بە! بۆ جەهەننەم بۆ ئاگری خوا!
عەبدولەلیك فەرمانی بە حەسان و قەبیسەدا کە هەستان و پێشوازیان لەعەمرۆ کرد و لەگەڵ ئەو ڕۆشتنە ژوور. عەمرۆ بەنۆکەرەکەی وت بڕۆ لای یەحیا و بڵێ بگاتە لای من.
نۆکەر وتی: بەڵێ! عەمرۆ وتی: ون بە.
کاتێك حەسان و قەبیسە ڕۆشتن، دەرگاکان داخران و عەمرۆ ڕۆشتە ژوور. عەبدولەلیك بەخێرهاتنی کرد و وتی: ئێرە ئێرە ئەی باوکی ئومەییە! ئەوی لای خۆی لەسەر تەختەکە دانیشاند وبۆ ماوەیەکی درێژ گفتوگۆی لەگەڵ کرد. دواتر وتی: شمشێرەکەی لێ بگرن. عەمرۆ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦) عەبدولەلیك پێی وت: دەتەوێت بەشمشێرەوە لای تەختەکەی من دانیشیت؟ شمشێرەکەیان لێ سەند. دواتر گفتوگۆیان کرد. عەبدولەلیك پێی وت: ئەی باوکی ئومەییە، کاتێك منت لەسەر کار لابرد، سوێندم خوارد ئەگەر بتبینم و دەستم بەتۆ بگات، بەندت بکەم. بەنی مەروان وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، دواتر ئازادی دەکەیت؟ وتی: بەڵێ، مەگەر دەتوانم چی لەباوکی ئومەییە بکەم! بەنی مەروان وتیان: سوێندەکەی خۆت بێنەرەدی ئەی سەروەری باوەڕداران.
عەمرۆ وتی: خوا سوێندی سەروەری باوەڕداران بێنێتەدی.
ئەو لەژێر فەرشەکەی زنجیرێکی دەرهێنا و وتی: هەستن و دەست و پێ و گەردنی بەتوندی ببەستنەوە. کۆیلەکەی ئەو کارەی کرد. عەمرۆ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێندت دەدەم بەخوا بەمشێوەیە من بەریتە لای خەڵکان. عەبدولەلیك وەڵامی دایەوە: ئەی باوکی ئومەییە، فێڵ لەکاتی مەرگ! نا، سوێند بەخوا بەزنجیرەوە تۆ نیشان خەڵکان نادەین. دواتر بەتوندی رایکێشا کە کەوت و دیانەکانی پێشەوەی بەر تەختەکە کەوت و شکا. عەمرۆ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێندت دەدەم بەخوا کاتێك ئێسقانەکانی منت تێکشکاند، بەلایترم بەسەردا نەهێنیت. عەبدولەلیك پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی کاتێك ئازادت بکەم، لەمن خۆش دەبیت و نامکوژیت وکاروباری قورەیش سامان دەدەمیت، ئازادم دەکردیت بەلام بێ گومان دەزانم هەر کات دو پیاو هاوشێوەی من و تۆ لەشارێکدا کۆببنەوە، یەکێك لەو دوانە، ئەویتر دەردەپەرێنێت. جگە لەمە هیچ کات نەبینراوە. کاتێك عەمرۆ بینی دەیەوێت بیکوژێت، وتی: ئەی کوڕی ژنی چاوشین،

پەیمانەکەی خۆت لەگەڵ من دەخەیتە ژێرپێ!
دەستەیەك دەڵێن: کاتێك دیانەکانی پێشەوەی عەمرۆ کەوت، ئەو بەردەوام دەستی لێ دەسو. عەبدولەلیك پێی وت: ئەی عەمرۆ، دەبینم دیانەکانی پێشەوەت لەشوێنێکدا کەوتوە کە دوای ئەوە هەرگیز ئارامی بەگیانت نابڕێت و خۆشی لەژیان نابینیت.
لەم کاتەدا بانگبێژ بۆ نوێژی ئێواری بانگیدا. عەبدولەلیك بۆ نوێژ لەگەڵ خەڵك ڕۆشتەدەر و فەرمانی بە عەبدولعەزیزی برایدا تا بیکوژێت. عەبدولعەزیز بەشمشێرەوە هاتە سەر سەری. عەمرۆ وتی: بەگەورەیی خوا و خزمایەتی خۆمان سوێندت دەدەم دەست بۆ کوشتنی من بەرز نەکەیتەوە. دەمەوێت کەسێك من بکوژێت کە لەتۆ دووربێت. ئەو شمشێرەکەی فرێدا و دانیشت. عەبدولەلیك نوێژی بەکورتی و خێرایی خوێند وگەڕایەوە. دەرگاکان لەپشت سەری ئەو داخران. خەڵك بینیان کە عەبدولەلیك هاتەدەر و عەمرۆ کوڕی سەعیدی لەگەڵ خۆی نەهێنا، ئەمەیان بەیەحیا کوڕی سەعید براکەی عەمرۆ ڕاگەیاند. ئەو لەگەڵ خەڵك هات و هەزار کۆیلە لەکۆیلەکانی عەمرۆ و دەستەیەکی فراوان لەخەڵکان هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەوان لەبەردەرگای کۆشك هاواریان دەکرد: ئەی باوکی ئومەییە، دەنگت بەئێمە بگەیێنە! حەمید کوڕی حورەیس و زوهەیر کوڕی ئەبرەد لەگەڵ یەحیا هاتن و دەرگای سایەوانەکەیان شکاند و بەشمشێر لەخەڵکیاندا. بەشمشێر لەوەلید کوڕی عەبدولەلیکیاندا. ئیبراهیم کوڕی عەرەبی (سەرپەرەستی دەبیرخانە) ئەوی هەڵگرت وبردیە ژوور.
کاتێك عەبدولەلیك نوێژی لەگەڵ خەڵك خوێند و گەڕایەوە، بینی کەعەمرۆ هێشتا نەکوژراوە. بە عەبدولعەزیزی وت: بۆ نەتکوشت؟ وتی: بەخوایەتی خوا و خزمایەتی سوێندی دام و دڵم بۆی سوتا. وتی: ڕیسوا بێت دایکە شلێ و بلەکەت کە میزی بەپاژنەی خۆیدا دەکرد، تۆ هاوشێوەی ئەویت. دواتر عەبدولەلیك کێردی هەڵگرت و لێیدا. کێردەکە کاریگەری لەسەر دانەنا. جارێکیتر لێیدا و بێ ئەنجام بو. دەستی بۆ بازوی برد و بینی زرێی لەبەردایە. وتی: زرێی پش؟ تۆ بۆ شەڕ ئامادە بویت! کێرد یا شمشێرێکی زۆر تیژی هەڵگرت و فەرمانیدا و لەسەر زەوی خەواندیان. لەسەر سینەی عەمرۆ دانیشت و سەری بڕی و بەردەوام دەیوت:

یا عمرۆ ان لا تدع شتمی و منقصتی      اضربك حیث تقول الهمة اسقونی

یانی: ئەی عەمرۆ، ئەگەر دەست لەجوێندان و ریسوا کردنی من هەڵنەگریت، بەشێوەیەك لێت دەدەم کە کەلەسەرت بڵێت: دڵۆپێك ئاوم دەرخوارد بدەن.

لەرز عەبدولەلیکی داگرت. ئەویان لەسەر سینەی عەمرۆ هەڵگرت و لەسەر تەختەکەی دایاننیشاند. وتی: هەرگیز کارێکی لەم شێوەم نەبینبو. نەکەسێك ئەوی کوشت کە بەدوای ئەم دنیادا دەگەڕا نەکەسێك کە بەدوای ئەو دنیادا.

یەحیا لەگەڵ هاورێکانی هاتنە لای بەنی مەروان و ئەوان موالی و کۆیلەکانیان کردە دەر. شەڕیان لەگەڵ یەحیا و هاورێکانی کرد. عەبدولرەحمان کوڕی دایکی حەکەمی سەقەفی هات و سەری براوی براکەی تەسلیم کردەوە. یەحیا سەری بۆ ناو خەڵکەکە هاویشت. عەبدولعەزیز کوڕی مەروان هەستا و زێر و زیوی لەقوماشەوە دەناڵاند و فرێدەدایە ناو خەڵك. کاتێك خەڵك زێروزیویان بینی، دەستیان بەفڕاندن کرد وبلاوەیان لێکرد. دواتر عەبدولەلیك فەرمانیدا زێروزیویان لەخەڵك وەرگرتەوە و تەسلیمی گەنجینەی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدولەلیك کاتێك عەمرۆ کوڕی سەعیدی کوشت کەکۆیلەکەی (کوڕی زەعیریە)ی بۆ نوێژ کردن لەگەڵ خەڵك رەوانە کرد. ئەوی کوشت و سەری فرێدایە ناو خەڵك. هەروەها تاشەبەردێکیان کێشا بەسەری یەحیادا. عەبدولەلیك تەختی خۆی بردە مزگەوت و هاتەدەر و لەسەری دانیشت. کوڕی مەروان سەیری کرد وبینی جێگەی کوڕەکەی وەلید چۆڵە. وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەویان کوشتبێت، تۆڵەی خۆیان کردۆتەوە. ئیبراهیم کوڕی عەرەبی کەنانی هات و وتی: وەلید لای منە، بریندار بوە، بەلاّم ترسی نیە.

دواتر یەحیا کوڕی سەعیدیان هێنایە لای عەبدولەلیك؟ فەرمانیدا تا بیکوژن. عەبدولعەزیز کوڕی مەروان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، گیانم قوربانی تۆ بێت! ئایا لەیەك رۆژدا دەتەوێت ئومەوییەکان کوشتار بکەیت! فەرمانیدا و یەحیایان خستە زیندانەوە. هەروەها مەبەستی ئەوەی کرد عەنبەسە کوڕی سەعید بکوژێت بەلاّم عەبدولعەزیز نێوەنجیگەری کرد. دوبارە ویستی عامر کوڕی ئەسوەدی کەلبی بکوژێت کە جارێکیتر عەبدولعەزیز نێوەنجیگەری کرد. فەرمانیدا منالّەکانی عەمرۆ کوڕی سەعیدیان خستە زیندان. دواتر عەبدولعەزیز ئەوانی لەگەڵ مامەکەیان یەحیا کوڕی سەعید هێنایەدەر و رەوانەی لای مەصعەب کوڕی زوبەیری کردن.

عەبدولمەلیك كوڕی مەروان كەسی بۆ لای هاوسەرە كەلبیەكەی عەمرۆ رەوانە كرد و وتی: ئەو پەیمان نامەی ئاشتی كە لەگەڵ عەمرۆ نوسیبوم، رەوانەی بكە. ژن بەنێردراوەكەی وت: بگەڕێرەوە و پێی بڵێ پەیماننامەی ئاشتیم لەگەڵ كفنی ئەودا دفن كرد تا لەرۆژی هەستانەوە خوا لەنێوان ئێوەدا داوەری بكات. نەژادی عەبدولمەلیك و عەمرۆ كوڕی سەعید لەئومەییە بەیەك دەگەیشت. ئەم عەبدولمەلیك كوڕی مەروان كوڕی حەكەم كوڕی ئەبی ئەلعاص كوڕی ئومەییە بو و ئەو عەمر كوڕی سەعید كوڕی عاص كوڕی ئومەییە. دایكی عەمرۆ كچی حەكەم پوری عەبدولمەلیك بو.

كاتێك عەبدولمەلیك مەصعەبی كوشت و خەڵك لای ئەو كۆبونەوە، منداڵەكانی عەمرۆ كوڕی سەعید لەگەڵ خەڵكان ڕۆشتنە لای. چوار كەس بون: ئومەییە، سەعید، ئیسماعیل و محەممەد. كاتێك سەیری كردن، پێی وتن: ئێوە ئەو بنەماڵەن بەردەوام خۆتان بەگەورەتر لەكەسانیتر دەزانن بەلاّم خوا ئەم لەپێشیەی بەئێوە نەبەخشیوە. ئەوەی لەنێوان من و باوكی ئێوە رویدا، روداوێكی تازە نەبو، بەڵكو كینەیەكی كۆن بو كە لەرۆژگاری جاهلیەوە لەگیانی پێشینانی ئێمە لەزیانی پێشینیانی ئێوە چێنرابو.

سەرەتا لەئومەییەی پرسی كەگەورەترینیان بو. ئەو نەیتوانی قسە بكات. سەعید كوڕی عەمرۆ كوڕی سەعید كە كوڕە نێوەنج بو، هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ شتێك دەدەیتەوە بەروی ئێمەدا كە لەرۆژگاری جاهلی رویداوە؟ ئێستا خواوەند ئیسلامی رەوانە كردوە، ئەو كینانەی لەناو بردوە، مژدەی بەهەشتی پێ بەخشیوین و لەدۆزەخ ئاگاداری كردوینەتەوە. بەلاّم ئەوەی لەنێوان تۆ و عەمرۆ رویداوە، ئەو كوڕە مامی تۆبو و تۆ خۆت لەوەی كردت، ئاگادارتری. عەمرۆ كوڕی سەعید پەیوەستی خوا بوە و خوا وەك داوەر بۆ ئەم كارە بەسە. سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر بتەوێت، ئێمە بەوەی لەنێوان ئێمەدا بوە، لەناو ببەیت، ژێر خاك بۆ ئێمە باشترە. عەبدولمەلیك دڵی بۆ ئەوان سوتا و وتی: باوكتان سەرپشكی كردم لەوەی یا بیكوژم یا بمكوژێت و من كوشتنی ئەوم هەڵبژارد. بەلاّم لەگەڵ ئێوە خوازیاری پەرەپێدانی پەیوەندی خزمایەتیم. ئەو دیاری فراوانی پێ بەخشین و لەخۆی نزیكی كردنەوە.

دەستەیەك دەڵێن: رۆژێك خالید كوڕی یەزید بە عەبدولمەلیك كوڕی مەروانی وت: سەرم سوڕماوە چۆن توانیت بەشێوەیەكی لەناكاو بەسەر عەمرۆ كوڕی سەعید كوڕی ئەشدەق

زاڵ ببیت. عەبدولەلیك وەڵامی دایەوە:

ادنيته منى ليسكن روعه        فاصول صوله حازم مستمكن

غضبا و محمية لدينى انه        ليس المسمى سبيله كالمحسن

یانی: ئەوم لەخۆم نزیك كردەوە تا ترسی برەوێتەوە و دواتر هاوشێوەی دورئەندێشێك لەكاری خۆم، هێرشم برد. بۆ توڕەیی و پاسەوانی كردن لەدینەكەم ئەو كارەم كرد چونكە خراپەكار لەگەڵ چاكەكار بەرابەر نیە.

دەستەیەك دەڵێن: لەسەر كار لابردنی عەمرۆ و كوشتنی ئەو كاتێك رویدا كە عەبدولەلیك بۆ شەڕی كوڕی زوبەیر مەبەستی عێراقی كردبو. عەمرۆ پێی وت: تۆ بەرەو عێراق دەڕۆیت، باوكت دوای تۆ منی بۆ ئەم كارە راسپاردوە و لەسەر ئەم بنەمایە بوبەردەوام لەبەرژەوەندی ئەو شەڕم كردوە. دوای خۆت فەرمانڕەوایی بەمن بسپێرە. عەبدولەلیك وەڵامی نەدایەوە. ئەو بۆ دیمەشق گەڕایەوە بەهەمان شێوە كەئاماژەمان پێدا.

دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوەنیە، بەڵكو عەبدولەلیك عەمرۆ كوڕی سەعیدی كردە فەرماندادی دیمەشق كەرێگەی ناسازگاری گرتەبەر و لەوێ مایەوە. و خوا زاناترە.

كاتێك عەبدالله كوڕی زوبەیر لەكوژرانی عەمرۆ ئاگادار بویەوە، وتی: كوڕی ژنی چاوشین، ركەبەرە دێوەكەی كوشت. بەمشێوەیە خراپەكاران بۆ شەڕی یەك هاندەدەین و ئەمە سزای كارەكانی خۆیانە (انعام/٦/١٢٩.) ئەم روداو و وتارە بەگوێی محەممەد كوڕی حەنیفە گەیشت. وتی: هەر كەس پەیمان بشكێنێت، خۆی تێكشكاندوە (فتح/٤٨/١٠) رۆژی هەستانەوە بەئەندازەی گوناحەكانی ئالای بۆ هەڵدەكەن.

## شۆڕشی جۆرجۆمیەكان لەشام

كاتێك عەمرۆ دژی عەبدولەلیك راپەڕی، سەردارێك لەفەرماندەكانی سوپا لەدەوروبەری دیمەشق لەكوێستانی لوكام شۆڕشی دەست پێكرد و دەستەیەكی زۆر لەجۆرجۆمیەكان و نبتیەكان و كۆیلە هەڵاتوەكان و كەسانیتر شوێنی كەوتن. ئەوی لەلوبنان كرد. كاتێك عەبدولەلیك لەكاری عەمرۆ تەواو بو، بەنهێنی كەسێكی بۆ لای ئەو شۆڕشگێرە رەوانە كرد و هەمو هەینیەك هەزار دیناری پێ دەبەخشی. پیاوەكە ئارام بویەوە و دەستی لەخراپەكاری لەناو شارەكان هەڵگرت. دواتر عەبدولەلیك سوحەیم كوڕی موهاجیری بۆ

ئەو دانا کە ڕۆشت و لەگەڵ پیاوە شۆڕشگێڕەکە مێهرەبانی کرد و بەشێوەیەکی نەناسراو گەیشتەلای و هاوڕێیەتی نیشاندا و سەرکۆنەی عەبدولمەلیکی کرد و جوێنی پێدا و بەڵێنی پێدا لەو شوێنانە ئاگاداری بکاتەوە کە عەبدولمەلیك زیانی بەردەکەوێت و شتی ئەوتۆی پێشنیار کرد کەلە ئاشتی باشتر بێت. دواتر سوحەیم خۆی بۆ هێرش کردنە سەر ئەوان ئامادە کرد و ئەوان بێ ئاگا و فریودراو بون. بۆ ئەم کارە سوپایەك لەکۆیلەکان و موالیەکان و ئازاکانی سوپای دەستنیشان کرد. ئەوانی لەشوێنێکی نزیك شاردەوە. دواتر لەناکاو هاواری کرد: هەرکەس لەکۆیلەکان (سوپای پیاوی شۆڕشگێر) بێتە لای ئێمە، ئازادە و ناوی لەدەفتەری ئازادکراوەکان دەنوسرێت. دەستەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبونەوە و لەبەرژەوەندی ئەو شەڕیان کرد. شۆڕشگێر و هاوڕێ ڕۆمیەکانی کوشتار کران و ژمارەیەکی زۆر لەنبتیەکان و جۆرجۆمیەکان لەناو چون. کەسێك لەناو پاشماوەکانی ئەوان جاڕیدا و ئەمانی بەهەمویان بەخشی. ئەوان لەشارەکانی خۆیان بڵاو بونەوە و ئاژاوە نەما و عەبدولەلیك گەڕایەوە و وتەکەی خۆی سەبارەت بە ئازاد کردنی کۆیلەکان بردە سەر.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

لەم ساڵەدا زوهەیر کوڕی قەیس فەرمانداری ئەفریقیە کوژرا. داستانی ئەومان لە ڕوداوەکانی ساڵی ٦٢/ ٦٨٢ زایینی گێڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا پیاوێك لەخەواریج لەمەنی دروشمی خەواریجی بەرز کردەوە (فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا). ئەو شمشێری لەکالآن دەرکێشا و دەستەیەك هاوڕێیەتیان کرد. خوا دەستی ئەوی کورت کردەوە وئەو پیاوە لە(جمرە) کوژرا.

عەبداللە کوڕی زوبەیر ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. فەرمانداری بەسرە و کوفە مەصعەب کوڕی زوبەیر بو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە شورەیح، و دامەزراوەی دادی بەسرە هشام کوڕی هوبەیرە. فەرمانداری خوراسان عەبداللە کوڕی خازم بو.

لەم ساڵەدا ئەبو الاسود دوئەلی لە ٨٥ ساڵیدا مرد.

## روداوەکانی ساڵی حەفتای کۆچی (٦٨٩- ٦٩٠ زایینی)

لەم ساڵەدا رۆمیەکان کۆبونەوە و مەبەستی شامیان کرد. عەبدولمەلیك رێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەوان گرتەبەر لەسەر ئەو بنەمای کە هەر هەینیەك هەزار دینار بەوان بدات. ئەم کارەی لەبەر ئەوە کرد چونکە لەزیان گەیاندنی ئەوان بۆ سەر موسوڵمانان دەترسا.
هەروەها لەم ساڵەدا بەوتەی دەستەیەك، مەصعەب روی لەمەککە کرد وسامان و مەڕوماڵاتی زۆری لەگەڵ خۆی برد و لەناو خزمەکانی خۆی دابەشی کرد. ئایینە دینیەکانی بەجێهێنا و مەڕوماڵاتی زۆری سەربڕی.
لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی زوبەیر ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. کارگوزارەکانی لەسەر شارەکان هەمان کەسانی ساڵی رابردو بون.

### شەڕی جوفرە

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك بۆ شەڕی مەصعەب بەڕێکەوت. خالید کوڕی عەبدالله کوڕی خالید کوڕی ئەسید پێی وت: ئەگەر من بۆ بەسرە رەوانە بکەیت و بەدوای من سوارە تیژپێکان بنێریت، هیوادارم دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرم. عەبدولمەلیك ئەوی رەوانە کرد. ئەو بەنهێنی لەگەڵ کەسە تایبەتەکانی خۆی ڕۆشتە ناو ئەوشارە و لای عەمرۆ کوڕی ئەصمەع دابەزی. دەستەیەك دەڵێن: لای عەلی کوڕی ئەصمەعی باهلی دابەزی. عەمرۆ کەسی بۆ لای عەباد کوڕی حوصەین رەوانە کرد کەسەرکردەی پاسەوانەکانی کوڕی مەعمەر بو. مەصعەب ئەوی وەك جێگری خۆی لەبەسرە دەستنیشان کردبو. عەمرۆ کوڕی ئەصمەع چاوەڕوانی دەکرد عەباد کوڕی حوصەین بەیعەتی لەگەڵ بکات. پێی وت: من پەنام بەخالید کوڕی عەبداللەدا و ویستم تۆ ئەمە بزانیت تا پشتیوانی بیت. نێردراو کاتێك گەیشتە لای کە لەئەسپەکەی دابەزی. عەباد پێی وت: پێی بڵێ سوێند بەخوا زینی ئەسپەکەم ناخەمە سەرزەوی تا هاورێ لەگەڵ سوارەکان بگەمە سەرتۆ. عەمرۆ کوڕی ئەصمەع بەخالید کوڕی عەبداللەی وت: ئێستاکە عباد کوڕی حوصەین دەگات و من توانای ئەوەم نیە تۆ لەبەرابەر ئەو بپارێزم، برۆ بۆ لای مالك کوڕی میسمەع.

خالید کوڕی عەبدالله بەراکردن هات بەشێوەیەك قاچی لەسەر زینەکەی جێگیر نەکردبو. ڕۆشتە لای مالك کوڕی مسمەع و وتی: پەنام بدە و بمپارێزە. ئەوی پەنادا. کەسی بۆ لای خەڵکی بەکر کوڕی وایل و ئەزدیەکان رەوانە کرد و داوای هاوکاری لێکردن. یەکەم ئاڵا کە بۆ ئەو هەڵکرا، ئاڵای بەنی یەشکر بو. عەباد کوڕی حوصەین هاورێ لەگەڵ سوارەکان گەیشت. دو سوپا لەبەرابەر یەك ریزان بەست بەڵام شەڕ روینەدا.

کاتێك بەیانی داهات، بەرەو جوفرەی ناف کوڕی حارس رۆیشتن. پیاوانێك لەبەنی تەمیم هاورێی خالید بون و لەناو ئەوان: صەعصەعە کوڕی معاویە، عەبدولعەزیز کوڕی بشر، مورە کوڕی موحکان و کەسانیتر. یارانی خالید (جەفرەییەکان) بون کە بەجوفرە پەیوەست دەکران. هاورێیانی کوڕی مەعمەری زەبیری بون. ئەم کەسانە لەناو هاورێیانی خالید بون: عوبەیدالله کوڕی ئەبی بەکرە، حومران کوڕی ئەبان و موغەیرە کوڕی موهەلیب. یەکێك لەخەڵکی زەبیری، قەیس کوڕی هەیسەمی سولەمی بو.

مەصعەب، زەحر کوڕی قەیسی جوعفی لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ هاوکاری کوڕی مەعمەر رەوانە کرد. عەبدولمەلیك ، عوبەیدالله کوڕی زیاد کوڕی زەبیانی بۆ هاوکاری خالید کوڕی عەبدالله رەوانە کرد. عوبەیدالله کەسی بۆ بەسرە رەوانە کرد و هەواڵی ئەو شارەیان بۆ هێنا. ئەو هەواڵی هێنا کەخەڵك بلاوەیان لێکردوە. بۆ لای عەبدولمەلیك گەڕایەوە. هەردولای شەڕکەر بۆ ماوەی بیست و چوار رۆژ شەڕی یەکیان کرد. چاوەکانی مالك کوڕی میسمەع زیانی بەرکەوت و ئەو لەشەڕ بێزار بو. نێردراوەکان لەنێوان ئەواندا هاتوچۆیان دەکرد و لەسەر ئەو بنەمایە ئاشتیان کرد کە خالید لەبەسرە بڕواتەدەر. مالك ئەوی دەرکرد.

دواتر مالك پەیوەستی (ساج) بو. عەبدولمەلیك بۆ دیمەیشق گەڕابویەوە. مەصعەب هەمو ئەندێشەی خۆی لەسەر ئەوە تەرکیز کردبو کەبەسرە بگەرێت چونکە هیوای دەبرد خالید لەوێ بدۆزێتەوە بەڵام زانی کە هەڵاتوە. مەصعەب لەکوڕی مەعمەر تورەبو و یارانی خالیدی بانگ و جوێنبارانی کردن: بەعوبەیدالله کوڕی ئەبی بەکرەی وت: کوڕی مەسروح، تۆ زادەی دەڵە سەگێکیت کە سەگان دەپەڕنە سەری و لەهەر رەنگێك (سور و زەرد و رەش و رەنگەکانیتر) تولە دەزێت، باوکی تۆ کۆیلەیەك بو کە لەقەڵای

تاییفەوە هاتە لای پێغەمبەر. دواتر ئێوە بڵاوتان کردەوە کە ئەبوسوفیان لەگەڵ دایکتانا خەوتوە. سوێند بەخوا ئەگەر زیندو بمێنم ئێوە پەیوەستی نەژادەکەتان دەکەمەوە. دواتر حیمرانی بانگ کرد وپێی وت: تۆ زادەی ژنێکی جولەکەیت و پیاوێکی زەبەلاح لەنبتیەکان. دایکتیان لەعەین التمر بەئەسیری گرت. جوێنی بەحەکەم کوڕی مونزەر، عەبدالله کوڕی فوزالەی ئەهرانی، عەلی کوڕی ئەصمەع، عەبدولعەزیز کوڕی بشر وکەسانیتردا و سەرکۆنە و سەرزەنشتی کردن و یەکی سەد قامچی لێدان. دواتر سەروریشی ئەوانی تاشی وماڵەکانی وێران کردن و سێ رۆژ لەبەردەم هەتاودا رایگرتن و بەزۆر ناچاری کردن واز لەژنەکانیان بهێنن و ئەوانی بەهەمو ماڵەکانی بەسرەدا گەڕاند و سوێندی دان ژنی ئازادە نەکەنە هاوسەری خۆیان. ماڵی مالك کوڕی میسمەعی خاپور کرد و ئەوەی لەناو ماڵەکەدابو تاڵانی کرد. لەناو ئەوان کەنیزێك کە عەمرۆ کوڕی مەصعەبی هێنایە دنیا.

سەرەتا لەبەسرە مایەوە و دواتر بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەوێ بو تا بۆ شەڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان هاتەدەر.

هەروەها لەم ساڵەدا عاصم کوڕی عومەر کوڕی خەتاب باوەگەورێی دایکی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کۆچی دوایی کرد. ئەو دو ساڵ پێش مردنی پێغەمبەر لەدایك بو.

## کوژرانی عومەیر کوڕی حوباب کوڕی جەعدەی سولەمی

لەم ساڵەدا عومەیر کوڕی حوباب کوڕی جوعدەی سولەمی کوژرا. ئێمە سەرەتا ئاماژە بەهۆکارەکانی شەڕ لەنێوان قەیس و تەغلەب دەدەین و دواتر چۆنیەتی کوژرانی عومەیر کوڕی حوباب دەگێڕینەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك شەڕی مەرج راهیت، بەسەرچو و زەفەر کوڕی حارسی کەلابی رۆشتە قرقیسیا و عومەیر لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم بەیعەتی کرد و لەهەمان کات لەسەر بنەمای کوژرانی قەیس لەمەرج کینەی لەدڵدابو و مەروان کوڕی حەکەم، عوبەیدالله کوڕی زیادی بۆ عێراق و جەزیرە رەوانە کرد، ئەوان لە سەرچاوەی گوڵ چاویان بەسولەیمان کوڕی سوردی خوازعی کەوت و عەبدالله بۆ شەڕ لەگەڵ زەفەر رۆشتە قرقیسیا. عومەیر رێگەی پێشرەوی لێگرت وپێشنیاری کرد پێش گەیشتنی سوپاکەی موختار بەموسڵ، بەرەو ئەم شارە بڕوات. ئەو رۆشت و لەخارز چاوی

بەئیبراهیم کوڕی ئەشتەر کەوت. عومەیر پەیوەستی بو. سوپاکەی عوبەیداللە شکستی خوارد و ئەو کوژرا. عومەیر هاتە قرقیسیا و هاورێ لەگەڵ زەفەر کوڕی حارس بەرێکەوت. ئەم دوانە شوێن کەلبیەکان و یەمانیەکان کەوتن چونکە ئەوان قەیسیان کوشتبو. لەگەڵ ئەم دوانە کەسانێك لەتەغلەب بون کە شان بەشانی ئەم دوانە شەڕیان دەکرد و رێنوێنیان دەکردن.

عەبدولەلیك لەم دوانەوە سەرقاڵی مەصعەب بو و عومەیر دەستی بەسەر نەصیبیندا گرت. دواتر لەمانەوە لەقرقیسیا بێزار و داوای ئەمانی لە عەبدولەلیك کرد کە ئەمانی پێ بەخشی. دوبارە دەغەڵکاری کرد کەئەوی لای کۆیلەکەی رەیان خستە زیندان. عومەیر شەرابی دەرخوارد خۆی و پاسەوانەکەیدا و بەتەناف خۆی لەدیواری زیندان شۆڕ کردەوە و بۆ جەزیرە گەڕایەوە و لەکەنارەکانی روباری بەیخ لەنێوان حەران وبەرەقە دابەزی. قەیسیەکان لەدەروی کۆبونەوە و ئەو بەهاوکاری ئەوان هێرشی دەکردە سەر کەلبیەکان و یەمانیەکان. ئەو کەسانەی لەگەڵیدابون، خۆشەویستیان لەگەڵ کچەکانی تەغلەب دەکرد و پیرانی مەسیحی گاڵتەیان بەئاینەکەی ئەوان دەکرد. ئەم کارە کێشەی لێکەوتەوە بەڵام بەشەڕ کۆتایی نەهات. ئەمە پێش رۆشتنی عەبدولەلیك بۆ لای مەصعەب و زەفەر بو.

دواتر عومەیر هێرشی کردە سەر کەلبیەکان و گەڕایەوە و لەخابور دابەزی. ماڵی تەغلەبیەکان لەنێوان خابور و فورات و دیجلە بو. ماڵەکان بەوشێوە بو ( یا لەوێ بو) کە عومەیر لای ژنێك لەتەمیمیەکان (لەناو تەمیمیەکان شوی کردبو) بەناوی دایکی دومیل دابەزی. جارێك کۆیلەیەك لەبەنی حەریش چەند سەرێك لەمەڕەکانی ئەو ژنەی گرت. ژن سکالای بردە لای عومەیر بەڵام ئەو پارێزگاری لەژنەکە نەکرد و ئەوان مەڕەکانیتری ژنەکەیان برد. کەسانێك لەتەغلەبیەکان رێگەی ئەم کارەیان لێگرتن و لەم بگرە و بێنەدا پیاوێك لەوان بەناو و نیشانی موجاشعی تەغلەبی کوژرا. دومیل بۆ ماڵەوە گەڕایەوە و دایکی سکاڵای لای کوڕەکەی کرد. ئەو سوارکارێکی ئازا وبەهێز لەتەغلەبیەکان بو. ئەم پاڵەوانە لەناو خەڵکەکەی خۆی بەرێکەوت و بەردەوام هاواری دەکرد کەخەڵکانی قەیس چیان لەگەڵ دەکەن و چۆن مەڕەکانی دایکیان رفاندوە. دەستەیەك لەوان کۆبونەوە و شوعەیس کوڕی مەلیکی تەغلەبیان کردە فەرمانڕەوای

خۆیان و هێرشیان کردە سەر بەنی حەریش و بەهاوکاری کەسیانێك لەنەمیر شەڕیان کرد. تەغلەبیەکان ئەوانیان کوشتار کرد و چەند وشترێکی ژنێکی ئەوانیان بەناوی دایکی هەیسەم ڕفاند. قەیسیەکان لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگریان کرد بەلاّم نەیانتوانی کارێك بکەن. ئەختەل وتی:

فان تسا لوان بالحریش فاننا منینا بنوك منهم و فجور

غداة تحامتنا الحریش کا نها کلاب بدت انیابها لهریر

و جاؤوا بجمع ناصری ام هیثم فما رجعوا من ذودها ببعیر

یانی: ئەگەر لە ئێمە سەبارەت بەخەڵکی حەریش بپرسن، دەڵێین: ئێمە گرفتاری دەستەیەك نەزان و خراپەکار بوین. ئەو بەرەبەیانەی حەریشیەکان پارێزگاریان لەئێمە کرد، وەك بڵێی ئەو سەگانە بون کەکەڵبەکانی خۆیان بۆ وەڕین دەردەخست. بە سوپایەك بۆ هاوکاری دایکی هەیسەم هاتن بەلاّم لەسی وشترەکەی ئەو تەنانەت نەیانتوانی یەك دانەیان بگەڕێیننەوە.

## شەڕی ماکسین

کاتێك زیانی نێوان قەیس و تەغلەب بەرزبویەوە و بەهێز بو (عومەیر سەرپەرەستی خەڵکانی قەیس و شوعەیس سەرەپەرەستی خەڵکانی تەغلەب) عومەیر لەماکسین لەناوچەکانی سەر بەشاری خابور شەڕی لەگەڵ بەنی تەغلەب و خەڵکەکەی دەست پێکرد. هەردولا شەڕێکی گەورەیان دەست پێکرد و ئەمە یەکەم شەڕ لەنێوان ئەواندا بو. لەتەغلەبیەکان پێنسەد کەس کوژرا. شوعەیس کوژرا. دوای کوژران قاچیان بڕیەوە. جەنگا تا کوژرا و بەردەوام دەبوت:

قد علمت قیس و نحن نعلم ان الفتی یقتل و هو اجذم

یانی: قەیسیەکان دەزانن و ئێمەیش دەزانین کە هەندێ کات قاچی جوامێرێك دەبردرێتەوە و ئەو دوبارە سورە لەسەر بوێری و ئازایەتی خۆی.

## یەکەمین جەنگی سەرسار

سەرسار ناوی روبارێکە کەسەرچاوەکەی رۆژهەلاتی شاری سنجار لەنزیك گوندێك بەناوی (سورق)ە. ئەم روبارە لەشوێنێك لەنێوان کوحیل و راس الایل دەرژێتە ناو فورات.

کاتێك ئەو کەسانەی ئاماژەمان پێدا، لەماکسین کوژران، تەغلەبیەکان داوای هاوکاریان لەهاورێکانی خۆیان کرد و هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە و خەلکی نەمر کوڕی قاست پەیوەستیان بون و موشەجەرین حارسی شەیبانی (لەگەورەکانی جەزیرە) هاتە لای ئەوان. هەروەها عوبەیداللە کوڕی زیاد کوڕی زەبیان لەبەرابەر قەیسیەکان هاوکاری ئەوانی کرد. لەبەر ئەمە بو کە مەصعەب کوڕی زوبەیر کینەی ئەوی لەدلّ گرت چونکە براکەی ئەو نابی کوڕی زیادی کوشت. عومەیر داوای هاوکاری لەتەمیمیەکان و ئەسەدیەکان کرد بەلام کەسیان هاوکاریان نەکرد. ئەوان لەسەر کەناری روباری سەرسار روبەروی یەك بونەوە. تەغلەبیەکان دوای شوعەیس، زیاد کوڕی هوبر یا یەزید کوڕی هوبری تەغلەبیان کردە فەرماندەی خۆیان. شەڕێکی قورس و مەترسیدار دەستی پێکرد. خەلکانی قەیس شکستیان خوارد و تەغلەبیەکان و هاورێکانیان کوشتارێکی گەورەیان لەناو ئەواندا دەست پێکرد. سکی سی ژنیان لەبەنی سەلیم هەلدڕی. لەیلای تەغلەبی کچی حارس ئەم هۆنراوەی وت. دەستەیەك دەلێن ئەمە هۆنراوەی ئەختەلە:

لما راونا و الصليب طالعا      و مار سرجس و سما ناقعا
و الخيل لا تحمل الا دارعا      و البيض فی ايماننا قواطعا
خلوا لنا الثرثار و المزارعا      و حنظلة طيسا و كرما يانعا

یانی: کاتێك سەیری ئێمەیان کرد و بینیان چلیپا (خاچ، ئەو دارەی عیسایان پێ لەخاچدا) و سەروەرمان سەرجیس بەژمەرێکی کوژەر هاتوە، و ئەسپەکان کە جگە لەپیاوە زرێپۆشەکانیان لەسەر نیە، و شمشێرە سپی و تیژەکان کە لەدەستی ئێمەدابون، سەرسارو کێلگەکانیان بۆ گەڕاندینەوە و گەنمی فراوان و رەزەکانمان بۆ خۆمان مایەوە.

## دوەم جەنگی سەرسار

دەڵێن: قەسیەکان کۆبونەوە و داوای هاوکاریان لەهاورێکیانی خۆیان کرد و بۆ شەڕ ئامادە بون و عومەیر کوڕی حوبابیان کردە فەرماندەی خۆیان. زەفەر کوڕی حارس (سەرکردەی تەغلب) لەقرقیسیاوە هاتە لای ئەوان و و هوبەر هاورێی ئەم دوانە بو. لەکەنارەکانی سەرسار روبەروی یەك بونەوە و بەشێوەیەکی سەرسەختانە شەڕیان کرد کە تا ئەو رۆژە خەڵك بەو شێوەیە شەڕیان نەکردبو. بەنی عامر کە لەباڵی چەپ وراستی خەڵکانی قەیس بون، شکستیان خوارد و خەڵکی بەنی سولەیم خۆڕاگریان کرد تا تەغلەبیەکان شکستیان خوارد و رایان کرد و دو کوڕەکەی یەشوع وکەسانێکیتر لەگەورەکانی تەغلەب کوژران. عومەیر کوڕی حوباب وتی:

فدا لفوارس الثرثار نفسی      و ما جمعت من اهل و مال

و ولت عامر عنا فاجلت      و حولی من ربیعة کا الجبال

اکاوحهم بدهم من سلیم      و اعصر کالمصاعیب النهال

یانی: قوربانی سوارەکانی سەرسار بێت گیان و ماڵ و حاڵی من. عامریەکان لەبەرابەر ئێمە هەڵاتن و بلاوەیان لێکرد و لەدەوری من کەسانی وەك کێوی خەڵکی رەبیعە بون. لەگەڵ ئەوان سوار لەسەر ئەسپە ڕەش رەنگەکان شەڕم کرد کە نەژادیان هاوشێوەی شێر نێرەکانی تێراو لەشادانیە.

زەفەر کوڕی حارس وتی:

الا من مبلغ عنی عمیرا      رسالة ناصح و علیه زاری

انترك حی ذی یمن و کلبا      و نجعل جدنا بك فی نزار

کمعتمد علی احدی یدیه      فخانته بوهن و انکسار

یانی: هاا چ کەسێکە پەیامی چاکەخوازی من بەعومەیر بگەیێنێت. چونکە لەترسی چارەنوسی ئەوە من هاوار دەکەم. ئایا خەڵکانی یەمان و کەلب پشت گوێ بخەین و باوەگەورێی خۆمان لەنزار بۆتۆ بگەرێیننەوە؟ وەك کەسێك کە هەمو قورسایی خۆی بخاتە سەر یەك دەست و ئەوسا دەستی بەشکستی و سستی، ئەو بێ هیوا بکات.

## جەنگی فودەین

عومەیر کوڕی حوباب هێرشی کردە سەر خەڵکی فودەین (گوندێك لەخابور) و تەغلەبیەکانی ئەو ناوچەی کوشتار کرد وتێکیشکاندن. نوفەیع کوڕی صەفاری مەحاربی وتی:

لو تسال الارض الفضاء علیکم    شهد الفدین بهلککم و الصور

یانی: ئەگەر خوازیاری زەوی بیت تا فراوانی بەتۆ ببەخشێت، فودەین و صوەر بۆ لەناوچونی ئێوە شایەتی دەدەن.

صوەر گوندێکە لەفودەین.

## جەنگی سوکەیر

ئەم شارە لەسەر کەناری خابورە و بەسوکەیری عەباس ناودەبرێت.

خەڵك کۆبونەوە و لەسوکەیر روبەروی یەك بونەوە. فەرماندەی خەڵکانی قەیس عومەیر کوڕی حوباب و سەرکردەی خەڵکانی تەغلەب و نەمر، یەزید کوڕی هوبەر. ئەوان بەسەختی شەڕیان کرد ولەکۆتاییدا تەغلەبیەکان ونەمریەکان شکستیان خوارد و عومەیر کوڕی جەندەل هەڵات. عومەیر کوڕی حوباب وتی:

و افلتنا یوم السکیر ابن جندل    علی سابح عوج اللبان مثابر

و نحن کررنا الخیل قدما شواذبا    دقاق الهوادی دامیات الدوائر

یانی: لەجەنگی سوکەیر کوڕی جەندەل لەدەستمان رزگاری بو سوار لەسەر ئەسپێکی تیژپێ و پەروباڵی ناسك و نەرم و کەمەری باریك، هەڵات. ئێمە بوین کە لەکۆنەوە ئەسپە تیژپێکانمان غار پێدەدا، ئەسپە گەردن ناسکەکان و یاڵە خوێن پژێنەکان.

کوڕی صەفار وتی:

صبحناکم بهن علی سکیر    و لا قیتم هناك الا قورینا

یانی: لەسەر پشتی ئەو ئەسپە تیژپێیە لەکاتی بەرەبەیان هێرشمان کردە سەر ئێوە و ئێوە روبەروی گرفتاریە مەترسیدارەکان بونەوە.

## جەنگی مەعارك

مەعارك شوێنێكە لەنێوان حەزەر و عەتیق لەسەرزەمینی موسڵ. تەغلەبیەكان لەگەڵ قەیسیەكان لەوێ روبەروی یەك بونەوە و شەڕێكی قورسیان دەست پێكرد. تەغلەبیەكان شكستیان خوارد و كوڕی صەفار وتی:

و لقد تركنا بالمعارك منكم          و الحضر والثرثار اجسادا جثا

یانی: لەسەرزەمینی مەعارك و سەرسار لاشەكانی ئێوەمان لەسەر یەك كەڵەكە كرد.
دەستەیەك دەڵێن: مەعارك و حەزەر یەك شوێنە كەئەوانیان لەوێ شكستدا وبۆ حەزەر دوریان خستنەوە ودەستەیەكی فراوان لەوانیان كوشتار كرد. دەستەیەك دەڵێن: دو جەنگ بون كە قەیسیەكان لەهەردوكیاندا سەركەوتن. و خوا زاناترە.
هەروەها لە لەبی لەسەرەوەی تكریت لەسەرزەمینی موسڵ روبەروی یەك بونەوە. لەم شەڕەدا نیو بەنیو بون: قەیسیەكان دەیانوت: ئێمە سەركەوتین و تەغلەبیەكان دەیانوت: ئێمە.

## جەنگ شرعەبیە

دواتر لە شرعەبیە روبەروی یەك بونەوە. فەرماندەی قەیسیەكان عومەیر و فەرماندەی تەغلەبیەكان كوڕی هوبەر. شەڕێكی قورس دەستی پێكرد. لەم رۆژەدا عەمار كوڕی مەهزەمی سولەمی كوژرا. شەڕ بەسەركەوتنی تەغلەبیەكان كۆتایی هات.
شرعەبیە لەشارەكانی تەغلەبیەكانە و لەسەرزەمینی مەنبەج. دەستەیەك دەڵێن: ئەم شەڕە لەسەرزەمینی مەنبەج رویدا. ئەمە راست نیە.

## جەنگی بەلیخ

تەغلەبیەكان كۆبونەوە و رویان كردە بەلیخ كەعومەیر و خەڵكانی قەیس لەوێ بون. بەلیخ روبارێك لەنێوان حەڕان و رەقەیە. روبەروی یەك بونەوە و شەڕیان كرد و تەغلەبیەكان شكستیان خوارد وكەسانێكی زۆر لەوان كوژران و سكی ژنان هەڵدرا بەهەمان شێوە كە لەجەنگی سەرسار ئەو كارەیان كرد. كوڕی صەفار وتی:

زرق الرماح و وقع كل مهند          زلزلن قلبك بالبليخ فزالا

یانی: لێدانی ڕمەکان و هاتنەخوارەوەی هەر شمشێرێکی هیندی، دڵی تۆی لەبەلیخ دەلەرزاند و لەبەر ئەمە دڵت داکەوت.

## جەنگی حەشاك

کوژرانی عومەیر کوڕی حوبابی سولەمی و کوڕی هوبەری تەغلەبی

کاتێك تەغلەبیەکان بینیان عومەیر بۆ کوشتار و شوێن کەوتنی ئەوان پێداگری دەکات، شارنشینەکان و گوندیەکانی خۆیان کۆکردەوە و بەرەو حەشاك بەرێکەوتن کە تەپۆڵەکەیەك لەنزیك شرعەبیەیە و (براق) لەتەنیشتیەتی. عومەیر بەرێکەوت و خەڵکانی قەیس و زەفەر کوڕی حارسی کەلابی و کوڕەکەی هوزەیل کوڕی زەفەر هاورێیەتیان دەکرد. فەرماندەی تەغلەبیەکان کوڕی هوبەر بو. لەسەر تەپۆڵەکەی حەشاك بەشێوەیەکی سەرسەرختانە شەر و پێداگریان کرد تا شەو ئەوانی لەیەك جیا کردەوە. دواتر بڵاوەیان لێکرد. بەیانیەکەی تا ئێوارێ شەڕیان کرد و دواتر لەیەك جیابونەوە.

تەغلەبیەکان لەسێیەم ڕۆژی شەڕ پەیمانیان بەست کە بڵاوەی لێنەکەن و پشت نەکەنە گۆڕەپانی شەڕ. کاتێك عومەیر پێداگری ئەوانی بینی و زانی ژنەکانیان هاورێیەتیان دەکەن، بەخەڵکانی قەیسی وت: ئەی خەڵکینە، بۆچونی من ئەوەیە لەبەرابەر ئەوان پاشەکشێ بکەن چونکە ئەوان شەڕخواز و بەدوای مەرگدا دەگەڕێن. کاتێك ئارام بونەوە و ڕویان لەسەرزەمینەکانی خۆیان کرد، بۆ هەر دەستەیەك لەوان، دەستەیەك شەڕکەر ڕەوانە دەکەین تا لەناویان ببەن. عەبدولعەزیز کوڕی حاتەم کوڕی نەعمانی باهلی وتی: دوێنێ و پێرێ گەورەکانی قەیست بەکوشتدا و دواتر ریسوا بویت و دەترسیت! دەستەیەك دەڵێن: ئەوە عۆیەیینە کوڕی ئەسمائ کوڕی خارجەی فەزاری بو ئەمەی پێ وت. ئەو بۆ هاوکاری کردن هاتبو. عومەیر توڕەبو و وتی: دڵنیام کاتێك ئاگری جەنگ خۆش ببێت، یەکەم کەسی کە ڕادەکەیت! عومەیر دابەزی و شەڕی دەست پێکرد و بەردەوام دەیوت:

انا عمیر و ابو المغلس    قد احبس القوم بضنك فاحبس

یانی: من عومەیر و باوکی موغلیسم، ئەوان لەتەنگانە دڵیان بەجەنگ سپاردوە، تۆیش دڵت بۆ شەڕ بەهێز بکە.

زەفەر لەم ڕۆژەدا شکستی خوارد و ئەمە سێیەم ڕۆژی جەنگ بو. ئەو بۆ قرقیسیا هەڵات. چۆنیەتی ئەوەی کە ئاگادار بویەوە عەبدولەلیك کوڕی مەروان مەبەستی ئەوەی کردبوە هێرش بکاتە سەری لەقرقیسیا. ئەو بەرێکەوت تا خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات. دەستەیەك دەڵێن: هەڵات و چونکە هیچ بەڵگەیەکی نەبو، ئەمەی کردە بیانوی خۆی. خەڵکانی قەیس شکستیان خوارد و تەغلەبیەکان سەرکەوتن و ئەوانیان کوشتار دەکرد و دەیانوت: نەتانزانی تەغلەب سەردەکەوێت؟

عومەیر لەلایەن جەمیل کوڕی قەیس لەبەنی کەعب کوڕی زوهەیر هێرشی کرایەسەر کەنەوی کوشت. دەستەیەك دەڵێن: هەمویان بۆ کوشتنی عومەیر هاودەنگ بون، بەتایبەت دوگەنج لەبەنی تەغلەب مەبەستی گیانی ئەویان کرد و ئەویان لەکاتێکدا بریندار و شەکەت ببو، بەردباران کرد و کوڕی هوبەر هێرشی کردەسەر عومەیر و کوشتی.

کوڕی هوبەر لەوڕۆژەدا بەقورسی بریندار بو. کاتێك جەنگ کۆتای هات، فەرمانی بەبەنی تەغلەبدا موراد کوڕی عەلقەمی زوهەیری وەك فەرماندەی خۆیان دەست نیشان بکەن.

دەستەیەك دەڵێن: کوڕی هوبەر لەدوەم ڕۆژی جەنگ لەسێ ڕۆژەکەی شەڕ هاتەدەر و فەرمانی بەبەنی تەغلەبدا پیاوێك بۆ فەرماندەیی خۆیان هەڵبژێرن. لەهەمان شەودا مرد. لەسێیەم ڕۆژ موراد سەرکردەیان بو. ئەوانی لەژێر ئاڵاکانیان بۆ شەڕ تەیار کرد و بەهەر هۆزێك لەیەك باوکی وت ژنەکانیان لەپشت سەری خۆیانەوە بێت. کاتێك عومەیر ئەمەی بینی، ئەوەی ئاماژەمان پێدا، هێنایە سەرزمان. کەسێك لەمبارەوە وتی:

ارقت باثناء الفرات و شفنی          نوائح ابکاها قتیل ابن هوبر

و لم تطلمی ان نحت ام مغلس          قتیل النصاری فی نوائح حسر

یانی: لەناوەڕاستی فورات خەو لەچاوم پەڕی و ژنانی شینگێر ئازاریاندام چونکە گیاندانی کوڕی هوبەر ئەوانی بۆ شین گێران ناچار دەکرد. تۆ نەشیاو نیت ئەگەر بۆ دایکی موغلیس بگریت: پیاوێکی کوژراوی مەسیحیەکان لەناو ژنانی داغدار و سەرروت.

کەسێکیتر سەرکۆنەی کوڕی هوبەری کرد چونکە عومەیری کوشتوە، دەڵێت:

و ان عمیرا یوم لاقته تغلب          قتیل جمیل لا قتیل ابن هوبر

یانی: عومەیر لەو رۆژەی کە تەغلەبیەکان هێرشیان کردەسەری، کوژراوی جەمیل بو نەك کوژراوی کوڕی هوبەر.

لەم رۆژەدا بەتایبەت لەناو بەنی سولەیم و غەنی کەسانێکی زۆر کوژران و هەورەها لەخەڵکانی قەیسیش. بەنی تەغلەب سەری عومەیر کوڕی حوبابیان بۆ عەبدولەلیك لەدیمەشق رەوانە کرد. ئەو دیاری و پاداشتی بەو کەسانەدا و بەجل وبەرگی گرانبای ئەوانی رازاندەوە. کاتێك عەبدولەلیك لەگەڵ زەفەر کوڕی حارس پەیمانی ئاشتی بەست و خەڵك لەدەوری ئەو کۆبونەوە، ئەختەل وتی:

| | |
|---|---|
| بنی امیی قدتنا ضلت دونکم | ابنا قوم هم اووا و هم نصروا |
| و قیس عیلان حتی اقبلوا رقصا | فبایعوا لك قسرا بعد ما قهروا |
| ضجوا من الحرب از غضت غواربهم | و قیس عیلان من اخلاقها الضجر |

یانی: ئەی ئومەوییەکان، لەگەڵ کوڕانی خەڵکێك بۆ ئێوە شەڕم کرد کە هەم ئەوان پەنایاندان و هاوکاریان کردن. خەڵکی قەیسی عەیلان بون کە بەدەم سەماکردنەوە هاتن و دوای ئەوەی سەرکوت کران، بەیعەتیان کرد. لەشەڕ هەڵاتن کەگردن و شانەکانی ئەوانی گەست، بێزاربون، عادەت و خوی خەڵکی قەیسی عەیلانە.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی دوورودرێژە.

کاتێك عومەیر کوڕی حوباب کوژرا، پیاوێك لەکوفە بەنەسمە کوڕی خارجەی فەزاری وت: بەنی تەغلەب عومەیر کوڕی حوبابیان کوشت. وتی: ترسم نیە، ئەم پیاوە لەناو خەڵکەکەی خۆی کوژرا، هێرشبەر بو نەك هەڵاتو. منداڵەکانی ئەو شێرە پیاوە، بێ باوك و بێ مێرد دەبن و دەبنە نێچیری هەر هۆزێك.

## جەنگی کوحەیل

کوحەیل ناوی شوێنێکە لەسەرزەمینی موسڵ لەکەنارەی رۆژئاوایی روباری دیجلە.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بو کاتێك عومەیر کوڕی حوبابی سولەمی کوژرا، تەمیم کوڕی عومەیر رۆشتە لای زەفەر کوڕی حارس و داوای لێکرد تۆڵەی خوێنی باوکی بکاتەوە. بەم کارە رازی نەبو. هوزەیل کوڕی زەفەر بەباوکی وت: سوێند بەخوا ئەگەر تەغلەبیەکان بەسەر ئەواندا سەرکەون، ئەم کارە دەبێتە ئەنگ بۆتۆ و ئەگەر ئەوان بەسەر تەغلەبیەکان سەرکەون، بارودۆخ زیاتر دژوار دەبێت چونکە تۆ هاوکاری ئەوانت

نەکردوە. زەفەر براکەی ئەوس کوڕی حارسی وەك جێگری خۆی لەقرقیسیا جێگیر کرد و بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر تەغلەبیەکان و شەڕیان لەگەڵ بکات. ئەو سوارانێکی کردە سەر بەنی فەدوکس (تیرەیەك لەتەغلەبیەکان) کەپیاوانی کوشتار و ژنانی گرفتار کرد و سامانەکانی تالآن کرد. تەنیا یەك ژن مایەوە کەداوای پەنای کرد و یەزید کوڕی حومران پێی بەخشی.

زەفەر کوڕی حارس کوڕەکەی هوزەیلی وەك فەرماندەی سوپایەك بۆ شەڕی خەڵکی کەعب کوڕی زوهەیر ڕەوانە کرد. ئەو خەڵکانی کەعبی کوشتار کرد. هەروەها موسلیم کوڕی ڕەبیعەی عوقەیلی بۆ شەڕ لەگەڵ دەستەیەك لەتەغلەبیەکان ڕەوانە کرد کە لەشوێنێك کۆببونەوە. موسلیم کوشتارێکی گرانی لەناو ئەواندا دەست پێکرد. دواتر زەفەر مەبەستی بەنی تەغلەبی کرد کە لەعەتیق شوێنێك لەسەرزەمینی موسڵ کۆببونەوە. کاتێك تەغلەبیەکان لەهاتنی ئەو ئاگادار بونەوە، لەشوێنەکەی خۆیان کۆچیان کرد و هەوڵیاندا لەدیجلە بپەڕنەوە. کاتێك گەیشتنە کوحەیل، زەفەر هاوڕێ لەگەڵ خەڵکانی قەیس ڕوبەڕویان بویەوە و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. هاوڕێیانی زەفەر هەمویان دابەزین و تەنیا زەفەر سوار لەسەر ئێستر مایەوە. شەویان بەکوشتار کردنی ئەوان بەسەر برد و سکی ژنەکانیان هەڵدری. زیاتر لەوانەی بەشمشێر کوژران، لەناو ئاوەکەدا خنکان. هەڵاتوان ڕویان لەلەبی کرد. زەفەر کوڕەکەی خۆی هوزەیلی ڕەوانە کرد کەزیانێکی گەورەی بەوان گەیاند مەگەر ئەو کەسانەی لەناو پەڕینەوە و ڕزگاریان بو. زەفەر دوسەد کەسی لەوان بەئەسیری گرت و بەئەشکەنجە کوشتاری کردن. ئەو لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| الا يا عين بكى بانسكاب | و بكى عاصما و ابن الحباب |
| فان تك تغلب قتلت عميرا | و رهطا من غنى فى الحراب |
| فقد افنى بني جشم بن بكر | و نمرهم فوراس من كلاب |
| قتلنا منهم ماتين صبرا | و ما عدلوا عمير بن الحباب |

یانی: ئەی چاوی من، بەدەم فرمێسکەوە بگری، بۆ عاصم و کوڕی حوباب بگری. ئەگەر تەغلەبیەکان عومەیر و دەستەیەك لەخەڵکانی غەنی یان لەکاتی شەڕدا کوشت، لەم لاوە سوارەکان لەکەلاب، پیاوانی بەنی جوشەم کوڕی بەکر وخەڵکانی نەمریان کوشتار کرد.

دوسەد کەس لەوانمان بەنەشکەنجە کوشت کەهەمویان لەگەڵ یەك تاڵ موی عومەیر بەرابەر نەبون.

کوڕی صەفاری مەحاربی لەمبارەوە وتی:

الم تر حربنا ترکت حبیبا          محالفها المذلة و الصغار

و قد کانوا او لی عز فاضحوا          و لیس لهم من الذل انتصار

یانی: ئایا نەتبینی کەشەڕەکەی ئێمە خەڵکی حەبیبی بەشێوەیەك بەجێهێشت کەئێستاکە گیرۆدەی ریسوایی و پەستین؟ ئەوان بەرێز وریزدار بون و ئێستا لەبەرابەر بەدبەختیەکان ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن.

لەیەکێك لەشەڕەکان قوتامی تەغلەبی بەئەسیری گیرا و سامانەکەی تاڵان کرا. زەفەر پشتگیری کرد بەشێوەیەك سامانەکەیان بۆ گەڕاندەوە و ئازادیان کرد. زەفەر کوڕی حارس رێزی لێگرت. ئەو وتی:

انی و ان کان قومی لیس بینهم          و بین قومك الا ضربة الهادی

مپن علیك بما اولیت من حسن          و قد تعرج لی من مقتل بادی

یانی: من لەگەڵ ئەوەی لەنێوان خەڵکەکەم و خەڵکەکەت تەنیا شمشێر داوەرە، لەبەرابەر چاکەکانی تۆ، وەسفت دەکەم چونکە نیشانەکانی مەرگ سێبەریان خستبوە سەرمن و تۆمنت رزگار کرد.

## جەنگی بشر

کاتێك کاروبارەکان بۆ عەبدولەلیك سامانی گرت و موسوڵمانان ئەویان وەك خەلیفە هەڵبژارد، ئەختەل شاعیری تەغلەبی ڕۆشتە لای وجەحاف کوڕی حەکیمی سولەمی دانیشتبو. عەبدولەلیك پێی وت: ئەی ئەختەل، ئەمە دەناسیت؟ وتی: بەڵێ ئەو کەسەیە سەبارەت بەو وتم:

الا سابل الجحاف هل هو تاثر          بقتلی اصیبت من سلیم و عامر

یانی: ها، لەجەحاف بپرسە کە ئایا لەداغی کوژراوانی خەڵکی سەلیم و عامر تورەیە؟ ئایا تۆڵە لەوان دەستێنێتەوە؟

قەسیدەکەی خوێندەوە. جەحاف خورمای تازەی دەخوارد. کاتێك ئەمەی بیست، لەتاو تورەیی و پەرێشانی خورماکان لەدەستی دەکەوتنە خوار. سەرئەنجام وەڵامی دایەوە و

وتی:

بلی سوف نبکیهم بکل مهند          و ننعی عمیرا بالرماح الشواجر

یانی: بەڵێ، بێ گومان بۆ ئەوان دەگریم، فرمێسك لەلێوی شمشێرە هندیەكان دەڕێژێنین و هەواڵی مەرگی عومەیر كوڕی حوباب لەنوكی ڕمە گیانستێنەكانەوە بەگوێی هەموان دەگەیێنین.

دواتر وتی: ئەی زادەی ژنی مەسیحی، هەرگیز گومانم نەدەكرد بتوانی لەبەرابەر من بەم شێوەیە قسە بكەیت! ئەختەل لەترسا لەرز دایگرت. ئەو بەرەو لای عەبدولەلیك ڕۆشت و داوێنی گرت و وتی: ئەمە پێگەی كەسێكە پەنا بۆ تۆ بێنێت؟ عەبدولەلیك پێی وت: پەنادراویت. دواتر جەحاف هەستا و بێ ئاگا و بێ هۆش ڕۆشتەدەر. دواتر لەگەڵ یەكێك لەدەبیرەكان میهرەبانی كرد و پەیمانێكی دروست كرد وجەحاف كردە سەرپەرەستی كۆكردنەوەی خێراتی خەڵكی بەنی تەغلەب وبەكر لەجەزیرە. بەیارانی خۆی وت: سەروەری باوەڕداران منی بۆ ئەم كارە دەست نیشان كرد. هەركەس دەیەوێت با بێت.

دواتر بەرێكەوت تا گەیشتە مێرگەلآنی هشام ویارانی خۆی ئاگادار كردەوە كە ئەختەل چ كارێكی كردوە و ئەو چۆن فەرمانەكەی دەركردوە، لەكاتێكدا ئەو سەپەرەستی هیچ كارێك لەهیچ شوێنێك نیە. هەركەس دەیەوێت ئەنگ لەمن و بنەماڵەكەم بسرێتەوە، هاورێیەتیم بكات چونكە سوێندم خواردوە سەرم ئەشۆم تا ڕۆژگاری تەغلەبیەكان ڕەش بكەم. هەمویان پشتیان تێكرد و گەڕانەوە جگە لەسێسەد پیاوی شەڕكەر كەپێیان وت: بەمەرگی تۆ دەمرین و بەزیندوبونی تۆ گیان دەگرین.

سەراسەری شەو غاریدا و لەبەرەبەیان خۆی گەیاندە رەحوب. ئەمە ناوی ئاوێك لەبەنی جوشەم لەتەغلەبیەكان بو. دەستەیەكی زۆر لەوانی لەوێ بینی. ئەوانی كوشتار كرد وئەختەلی بەئەسیری گرت. ئەو عابایەكی كۆنەی لەبەردابو. ئەو كەسەی ئەوی بەئەسیری كرد گومانی كردە كە كۆیلەیە و پرسی: كێیە؟ وتی: بەندەیەكی داماو. پیاوەكە ئازادی كرد. ئەختەل خۆی لەبن چاڵێك حەشاردا چونكە دەترسا كەسێك بیبینێت و بیناسێتەوە. كاتێك جەحاف گەڕایەوە، لەچاڵەكە هاتەدەر. جەحاف لەكوشتاری تەغلەبیەكان سنوری بەزاند. سكی ژنانی هەڵدڕی و منداڵەكانی دەردەهێنا و كاری ئەوتۆی كرد كە تا ئەو رۆژە هاوشێوەی نەبینراوە. كاتێك گەڕایەوە، ئەختەل

ڕۆشتە لای عەبدولەلیك و ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

لقد اوقع الجحاف بالبشر وقعة          الی الله منها المشتكی و المعقول

یانی: جەحاف بەشێوەیەك ستەمی لەبشریەكان كرد كە تەنیا دەتوانین سكالاً بۆ دەرگای خوا بەرز بكەینەوە و داوای داد لەو بكەین.

جەحاف هەلأت و عەبدولەلیك بەدوایدا گەڕا. ئەو بۆ سەرزەمینی رۆم هەلأت. دوای كوشتاری بشریەكان هۆنراوەكەی هۆنیەوە و روی دەمی كردە ئەختەل و وتی:

ابا مالك هل لمتنی او حضضتنی          علی القتل ام هل لامنی كل لائم

الم افنكم قتلا و اجدع انفكم          بفتیان قیس و السیوف الصوارم

بكل فتی ینعی العمیر بسیفه          اذا اعتصمت ایمانهم بالقوائم

فان تطردونی تطردونی و قد جری          بی الورد یوما فی دماء الاراقم

نكحت بسیفی فی زهیر و مالك          نكاح اغتصاب لا نكاح الدراهم

یانی: ئەی باوكی مالك، ئایا تۆ نەبویت منت بۆ كوشتار سەركۆنە كرد یا هانتدام تا هەمو سەركۆنەكەران منیان سەركۆنە كرد؟ ئایا ئێوەم بەكوشتار كردن لەناو نەبرد، لوتی ئێوەم نەبڕی، ئەم كارەم بەهاوكاری گەنجەكانی قەیس و تیغە تیژەكانی ئەوان كرد. لەگەلْ هەمو ئەو گەنجانەی هەوالّی مەرگی عومەیر كوڕی حوبابیان بەلێوی تیژی شمشێرەكەی خۆیاندا و دەستەكان شمشێرەكانیان بەدەستە ئاسنینەكانی خۆیان گرت. ئەگەر دورم بخەنەوە، كاتێك دورتانخستومەوە كە مەلەم لەخوێنی ئەرقەمیەكان كرد. لەخەڵكی زوهەیر و مالك ژنم هێنا بەلأم ئەم ژن هێنانە بەشمشێر و بەزۆر بو نەك ژن هێنانێك كە دەرەمی تیا ببەخشن.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتە.

جەحاف بەردەوام لەسەرزەمینەكانی رۆم دەگەڕا و لەتەربزندە (تەرابوزان) تا گالیكلای بڕی. ئەو بۆ كەسانی نزیكی عەبدولەلیك لەقەیس كەسانی وەك نێوەنجیگەر رەوانە كرد و پێداگری كرد تا لەعەبدولەلیك ئەمانی بۆ وەربگرن. عەبدولەلیك ئەمانی پێدا. ڕۆشتە لای عەبدولەلیك وئەو فەرمانی پێدا خوێنبایی كوژراوەكان بدات. ئەو بەلێنیدا و بۆ ئەم كارە هەوڵەكانی خۆی خستەگەڕ. جەحاف لەشامەوە ڕۆشتە لای حەجاج و داوای هاوكاری لێكرد. حەجاج وتی: لەكەیەوە من بەخیانەتكار دەزانیت؟ جەحاف وتی:

ڕاستی دێتە سەرزمانت. سەد هەزار درەمی پێدا و خوێنبایەکەی کۆکردەوە و تەسلیمی خاوەنەکانی کرد.

دواتر جەحاف بو بەکەسێکی خۆپارێز وچاکەکار و ڕۆشتە حەج و دەستی بەپەردەی کەعبەوە گرت و هاواری دەکرد: خوایە، بمبەخشە چونکە گومان ناکەم ببەخشرێم. محەممەد کوڕی حەنیفە وتارەکەی بیست و وتی: پیرەپیاو، گریانی تۆ بۆ دەرگای خواوەند خراپترە لەگوناحەکانی تۆ !چونکە بێ هیوابون لەبەخشینی خوا خراپترین گوناحە.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری گەڕانەوەی جەحاف ئەوە بو کەپاشا (ئیمپراتۆری) ڕۆم ڕێزی لێگرت و لەخۆی نزیکی کردەوە و پێشنیاری باوەڕهێنان بەئایینی مەسیحی پێکرد تا لەبەرابەر ئەوە، هەرچی بخوازێت، پێی ببەخشێت. جەحاف وتی: لەبەر ئەوە نەهاتومەتە لای تۆ کەپشتم کردبێتە ئیسلام. لەو ساڵەدا موسوڵمانان بۆ شەڕی ڕۆمیەکان ڕەوانە بون و شەڕی هاوینەیان کرد وشکستیان خوارد. بە عەبدولەلیکیان ڕاگەیاند کەجەحاف ئەوانی شکستداوە. عەبدولەلیك کەسی ڕەوانە کرد و ئەمانی پێ بەخشی. ئەو بەرێکەوت و کەسانێکی لەخەڵکی بشر لەگەڵ خۆی هەڵگرت و کفنی پۆشی و وتی: هاتوم بۆ لای ئێوە تا خوێنی من برێژن و دادی خۆتان لەمن وەربگرن. گەنجەکان مەبەستی گیانی ئەویان کرد بەڵام پیرەکان ڕێگریان لێکردن. لێیخۆشبون و ئەو روی کردە مەککە. عەبدالله کوڕی عومەر دەنگی دەبیست کەبەردەوام بەدەوری ماڵی خوا دەسوڕێتەوە و دەڵێت: ئەی خوایە، بمبەخشە، هەرچەندە هیوام بەبەخشین نیە. کوڕی عومەر وتی: ئەگەر جەحاف دەبویت، شتێکت بەوە زیاد نەدەکرد. وتی: من بەراستی جەحافم.

## روداوەکانی ساڵی حەفتا ویەکی کۆچی (٦٩٠ زایینی)

## کوژرانی مەصعەب کوڕی زوبەیرو زاڵبونی عەبدولمەلیک بەسەر عێراق

لەم ساڵەدا لەجەمادی الثانی/ نۆڤەمبەری ٦٩٠ زایینی مەصعەب کوڕی زوبەیر کوژرا و عەبدولمەلیک کوڕی مەروان دەستی بەسەر عێراقدا گرت.

پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك عەبدولمەلیك، عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاصی کوشت، شمشێری خستە ناو دوژمنەکانی خۆی وبەهەمان شێوە کەناماژەی پێدرا، ئەوانی لەناو برد. شام بۆ ئەو ئارام بو. کاتێك لەوێ دوژمنی نەما، مەبەستی مەصعەب کوڕی زوبەیری لەعێراق کرد. لەگەڵ یارانی خۆی راوێژی کرد. یەحیا حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص (مامی) پێشنیاری کرد تا بەشام بەسەندە بکات و عێراق بۆ کوڕی زوبەیر بەجێبێڵێت. عەبدولمەلیك بەردەوام دەیوت: هەر کەس دەیەوێت بێتە سەر رێگەی راست، ناسازگاری لەگەڵ پێشنیارەکەی یەحیا بکات. کەسانێکیتر وتیان: ئەم ساڵ وشکەساڵیە و تۆ دوساڵە شەڕدەکەیت وسەرکەوتنت بەدەست نەهێناوە، ئەمساڵ لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە. عەبدولمەلیك بەوانی وت: شام شارێکی گەورە و بێ داهاتە و من دەترسم سامان و داراییەکەی بەرەو کۆتای بڕوات. جیاواز لەوە زۆرێك لەگەورەکانی عێراق نامەیان بۆ نوسیوم و داوا دەکەن من بڕۆم. براکەی محەممەد کوڕی مەروان پێی وت: بۆچونی راست ئەوەیە بەدوای راستیدا بگەڕێیت و بڕۆیتە عێراق چونکە هیوادارم خوا سەرکەوتن بەتۆ ببەخشێت. کەسانیتر وتیان: بۆچونی راست ئەوەیە لەشام بمێنیتەوە و یەکێك لەکەسانی خۆت هاورێ لەگەڵ سوپایەك رەوانە بکەیت. عەبدولمەلیك وەڵامی دایەوە: جگە لەپیاوێکی قورەیشی بەئەزمون و کارزان ناتوانێت سامان بەم کارە ببەخشێت. ئەگەری هەیە کەسێك رەوانە بکەم کەبوێر و ئازا بێت بەڵام ئەزمونی نەبێت. من شارەزای کاروباری جەنگم وئەگەر پێویست بکات، کاری شمشێر و فریو هەردوکیان بەباشی دەزانم. مەصعەب پیاوێکی بوێر و لەبنەماڵەی بوێرەکانە بەڵام لەشەڕدا ئەزمونی نیە. ئاسایشی خۆش دەوێت. لەدەوروبەری ئەو دوژمنەکانی ئەون و لای من کەسانێك کەهەمویان چاکەخوازی منن.

کاتێك مەبەستی ڕۆشتنی کرد، هاوسەرەکەی عاتکە کچی یەزید کوڕی معاویەماڵئاوایی لێکرد. ژن گریا و کەنیزەکانی هاوڕێ لەگەڵ ئەو گریان. عەبدولەلیك کوڕی مەروان وتی: خوا نفرین بکات کەسیری عێزەت. دەڵێی ئێمەی دەبینی کاتێك وتی:

اذا ما اراد و لم یثن همه    حصان علیها عقد در یزینها

نهته فلما لم تری النهی عاقة    بکت و بکی مما عناها قطینها

یانی: کاتێك ئەو یاخیە مەبەستی شەڕ بکات، جوان روخسارێك کە گەوهەرێکی گەورەی لەگەردنبەندەکەی بەسینەی سپیەوە هەڵواسیوە، ڕێگەی لێ ناگرێت. ئەو گوڵ روخسارە، ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرت و کاتێك بینی ئەم کارەی کاریگەر نەبو، دەستی بەگریان کرد و کەنیزەکەی لەگریانی ئەو گریانی دەست پێکرد.

عەبدولەلیك بەرەو عێراق بەڕێکەوت. کاتێك ئەم هەواڵە بەمەصعەب گەیشت، کەسی بەدوای موهەلیب رەوانە کرد کەسەرقاڵی شەڕ لەگەڵ خەواریج بو. پرسیاری لێ کرد دەبێت چی بکات. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کرد. بەمەصعەبی وت: بزانە کەخەڵکانی عێراق نامەیان بۆ عەبدولەلیك نوسیوە، من لەخۆت دورمەکەرەوە. مەصعەب بەموهەلیبی وت: خەڵکانی بەسرە تەنیا بەوە رازی دەبن کەتۆ بکەمە فەرماندەیان و بۆ شەڕی خەواریج رەوانەت بکەم. ئەوان گەشتونەتە بازاری ئەهواز و من پەسەندی ناکەم عەبدولەلیك روبکاتە من و من مەبەستی ئەو نەکەم. ئە م سنورە بۆ من بپارێزە.

ئەو بۆ شەڕ لەگەڵ خەواریج گەڕایەوە و مەصعەب هاوڕێ لەگەڵ قەیس کوڕی ئەحنەف بەرەو کوفە بەڕێکەوت. ئەحنەف لەکوفە مرد. مەصعەب ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری نەخەعی بانگ کرد. ئەو فەرمانداری موسڵ و جەزیرە بو. کاتێك هاتە لای مەصعەب، ئەوی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی و بەڕێکەوت تا لەباجومیرا دابەزی کە شوێنێکە لەنزیك ئاوانا و نشینگەیەك بۆ مانەوەی خەڵك. لەوێ ئوردوی لێدا.

عەبدولەلیك بەڕێکەوت. فەرماندەی پێشەنگەکانی براکەی محەممەد کوڕی مەروان و خالید کوڕی عەبدالله کوڕی خالید کوڕی ئەسید بون. لەقرقیسیا دابەزین و گەمارۆیان خستە سەر زەفەر کوڕی حارسی کەلابی. زەفەر ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەوان گرتەبەر کەبە خواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

زەفەر کوڕەکەی هوزەیلی لەگەڵ عەبدولمەلیك رەوانە کرد کە لەگەڵی مایەوە و دواتر پەیوەستی مەسعەب کوڕی زوبەیر بو. کاتێك زەفەر و عەبدولمەلیك ئاشتیان کرد، عەبدولمەلیك و هاورێکانی بەرێکەوتن و لەشوێنێکی نزیك لەسوپاکەی مەسعەب دابەزین. لەنێوان دو سوپاکە سێ فەرسەخ رێگە بو. عەبدولمەلیك نامەی بۆ عێراقیەکان نوسی، چ ئەوانەی نامەیان بۆ نوسیبو، چ ئەوانەی نامەیان نەنوسیبو. دەستەیەك دەڵێن: دو فەرسەخ دوری نێوان دو سوپاکەبو. ئەو نامەی بۆ عێراقیەکان رەوانە کرد و بەڵێنی پێدان کە ئیسفەهان بەوان دەبەخشێت تا سامانەکەی بخۆن. دەستەیەك دەڵێن: هەرکەس کە نامەی بۆ نوسی، داوای لێکرد فەرمانڕەوایەتی ئیسفەهان بەو ببەخشێت؟ عەبدولمەلیك بەخۆی وت: ئەم ئیسفەهانە چیە کە هەموان داوای دەکەن؟

هەموان نامەکانی خۆیان شاردەوە جگە لەئیبراهیم کوڕی ئەشتەر کەنامەکەی سەربەمۆر بردە لای مەصعەب. مەسعەب خوێندیەوە و بینی بەڵێن بەئیبراهیم دەدات ئەگەر پەیوەستی ببێت، لەبەرابەردا فەرمانڕەوایەتی عێراقی پێ دەبەخشێت. وتی: دەزانی چی لەنامەکەدا نوسراوە؟ ئیبراهیم وتی: نازانم. وتی: پێشنیاری ئەمە و ئەوەی پێکردویت و ئەمە شتێکە دڵ دەرفێنێت. ئیبراهیم وتی: فێڵ و فریو بەکار نابەم. سوێند بەخوا عەبدولمەلیك لەهیچ کەس زیاتر لەمن بێ هیوا نیە. نامەی بۆ هەمو هاورێکانی تۆ نوسیوە، مژدە و بەڵێنی هاوشێوەی ئەوەی منی بەهەمویان داوە. گوێ لەمن بگرە و هەمویان بکوژە. مەصعەب وتی: ئەوسا هۆزەکانیان هاورێیەتی من ناکەن. ئیبراهیم وتی: بەنْدی ئاسنین بکەرە پێیان و بۆ سنورەکانی (سپید خوسرەو) دوریان بخەرەوە و لەوێ زیندانیان بکە وپاسەوانیان بۆ دابنێ کەئەگەر شکستت خوارد و هۆزەکانیان بلاوەیان لێکرد، ئەوان بکوژن، ئەگەر سەرکەوتیت، ئەوان ببەخشیت و ئازادیان بکەیت. مەصعەب وتی: گرفتاریەکانم زۆرن و دەترسم ئەگەر بەمەوە سەرقاڵ بم، لەوان بەجێ بمێنم. خوا ببەخشیت ئەبو بەحر (ئەحنەف کوڕی قەیس) کەبەردەوام منی لەپەیمان شکاندنی عێراقیەکان ئاگادار دەکردەوە و دەیوت: عێراقیەکان هاوشێوەی ژنێکی لەشفرۆشن کەهەر رۆژ بەدوای پیاوێکی کیرئەستورتر دەگەڕێن و ئەوان هەمو بەرەبەیانێك فەرمانداریکی ستەمکارتریان دەوێت.

کاتێك قەیس کوڕی هەیسەم بینی، عێراقیەکان دەیانەوێت فریو لەمەصعەب بکەن،

بەوانی وت: هاوار لەئێوە! رێگە مەدەن خەڵکانی شام بێنە ناو شارەکەتان! سوێند بەخوا ئەگەر چاوی تەماح ببڕنە ئێوە، ماڵەکانتان دەگرن و جێگەتان لێ تەنگ دەکەن. سوێند بەخوا سەروەری خەڵکانی شامم بینی لەبەردەگای خەلیفەدا وەستابو و شادمان دەبو کە خەلیفە ئەو بۆ کارێك رەوانە دەکات. چاوم بڕیە خۆمان و بینیم لەشەڕە هاوینیەکان باروبنەی هەرکام لەئێمە چەندین وشتر هەڵیدەگرێت بەڵام هەرکام لەوان کەشەڕی دەکرد سوار ئەسپ دەبو و باروبنەکەی دەخستە سەر پشتی خۆی.

عێراقیەکان گوێیان لەوتەکانی نەگرت. کاتێك دو سوپا لەیەك نزیك کەوتنەوە، عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کەسی بۆ لای مەصعەب رەوانە کرد و وتی: سڵاو لەخوشکەزاکەت بکە (دایکی مەصعەب کەلبی بو) و پێی بڵێ دەست لەبانگەواز کردن بۆ براکەی هەڵبگرێت و منیش دەست لەبەیعەت وەرگرتن بۆ خۆم هەڵدەگرم و کاروبار بەراوێژی موسوڵمانان دەسپێرین. مەصعەب وتی: لەنێوان ئێمەدا تەنیا شمشێر داوەری دەکات.

عەبدولمەلیك محەممەدی برای بۆ پێشەوە رەوانە کرد و مەصعەب سەرکردەی سوپاکەی خۆی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر. چاویان بەیەك کەوت و روبەروی یەك بونەوە. ئاڵادارەکەی محەممەد کوژرا و مەصعەب بەردەوام هێزە پشتیوانەکانی بۆ ئیبراهیم رەوانە دەکرد. ئەو پاشەکشێی بەمحەممەد کرد. عەبدولمەلیك، عەبداللە کوڕی یەزیدی بۆ هاوکاری براکەی رەوانە کرد. شەڕ روی لەدژواری کرد و موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی باوکی قوتەیبە کوڕی موسلیم (لەیارانی مەصعەب) کوژرا. مەصعەب، عەتاب کوڕی وەرقای بۆ پشتیوانی ئیبراهیم رەوانە کرد کە لەم کارە رەنجا. وتی: پێم وت: کەسانی وەك عەتاب بۆ پشتیوانی من رەوانە مەکە، هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە ١٥٦/٢). عەتاب کارێکی کرد کەخەڵك پاشەکشێیان کرد. ئەو لەگەڵ عەبدولمەلیك نامەیان بۆ یەك رەوانە کردبو و دەستی بەیعەتی پێدابو. کاتێك پاشەکشێی کرد، کوڕی ئەشتەر خۆڕاگری کرد تا کوژرا. عوبەید کوڕی مەیسەرە لەموالیەکانی بەنی عوزرە ئەوی کوشت و سەرەکەی بردە لای عەبدولمەلیك.

خەڵکانی شام پێشڕەویان دەست پێکرد و مەصعەب لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری کرد. ئەو بە قەتن کوڕی عەبداللەی حارسی وت: ئەی باوکی عوسمان، سوارەکانت بۆ پێشەوە غار

پێبدە. وتی: دەترسم مەزحەجیەکان لەبەر هیچ بکوژرێن. بەحەجار کوڕی ئەبجەری وت: ئەی باوکی ئەسید، پێشڕەوی بەسوارەکانت بکە. وتی: ئەمانە گەنیون. وتی: ئەوەی بەرەو لای دەڕۆیت، گەنیوترە. بەمحەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەعیدی وت و ئەو وەڵامی دایەوە: کەسیتر ئەو کارەی نەکردوە، منیش نایکەم. مەصعەب وتی: ئەی ئیبراهیم، بەڵام ئیتر ئیبراهیمم نیە. دواتر ئاوڕی دایەوە و عوروە کوڕی موغەیرەی شەعبەی بینی. پێی وت: هەواڵی کاری حسین کوڕی عەلی بەمن بڵێ کە چۆن رازی نەبو ملکەچی فەرمانی کوڕی زیاد ببێت و مەبەستی جەنگی کرد. ئەو ئاگاداری کردەوە. مەصعەب وتی:

و ان الاولی بالطف من ال هاشم          تاسوا فسنوا للکرام التاسیا

یانی: شەرکەرانی کەناری روبار لەبنەماڵەی هاشم پێش هەموان کەوتن و ئایینێکیان بۆ خەڵك بەجێهێشت کە دەبێت گەورە و رێزدارەکان شوێنیان بکەون.

عوروە وتی: زانیم ناگەرێتەوە تا دەکوژرێت.

دواتر محەممەد کوڕی مەروان لەمەصعەب نزیك کەوتەوە وپێی وت: من کوڕی مامەکەت محەممەد کوڕی مەروانم، بەئەمانی سەروەری باوەڕداران رازی ببە. مەصعەب وتی: سەروەری باوەڕداران لەمەککەیە (یانی براکەم عەبدالله کوڕی زوبەیرە). وتی: ئەم خەڵکە بەتەنیا جێت دەهێڵن. ئەو بەپێشنیارەکەی رازی نەبو. محەممەد، بانگی عیسا کوڕی مەصعەبی کرد. مەصعەب وتی: بزانە چی دەوێت. عیسا لەمحەممەد کوڕی مەروان نزیك کەوتەوە. کوڕی مەروان وتی: من چاکەی تۆ و باوکتم دەوێت، ئێوە ئەمانتان پێ بەخشراوە. عیسا گەڕایەوە و پەیامەکەی گەیاند. باوك وتی: بڕوام وایە ئەم خەڵکە بەڵێنەکەی خۆیان سەبارەت بەتۆ ببەنەسەر. ئەگەر دەتەوێت برۆ لای ئەوان. عیسا وتی: نامەوێت ببمە باسی سەر زاری ژنانی قورەیش کە دەستم لەهاوکاری کردنی تۆ هەڵگرت و گیانی خۆم بەبەرێزتر لەگیانی تۆ زانی. مەصعەب وتی: لەگەڵ هاورێکانت برۆ لای مامت لەمەککە و پێی بڵێ عیراقیەکان چیان لەگەڵ من کرد، من بەجێ بێڵە چونکە بەناچاری دەکوژرێم. عیسا وتی: هەرگیز نابمە نێردراوی تۆ بۆ مەککە، بەڵام ئەی باوکە بەرەو بەسرە ئەسپ غار بدە چونکە خەڵکەکەی فەرمانبەرن، یا برۆ مەککە کەبراکەت لەوێیە. مەصعەب وتی: نامەوێت قورەیشیەکان گومان بکەن هەڵاتم.

بەعیسای کوڕی وت: بۆ پێشەوە برۆ کە دەتپارێزم. ئەو لەگەڵ هاورێکانی خۆی بۆ پێشەوە غاریدا. ئەوەندە شەڕیان کرد تا هەمویان کوژران. پیاوێك لەخەڵکانی شام هات تا سەری عیسا لەجەستەی جیا بکاتەوە. مەصعەب هێرشی کردە سەر و کوشتی و هێرشی کردە سەر کەسانیتر. گەڕایەوە و دوبارە هێرشی کرد و پاشەکشێی پێ کردن. عەبدولەلیك ئەمانی پێ پێشنیار کرد و وتی: بۆ من دژوارە تۆ بکوژرێیت. بەئەمانەکەی من رازی ببە و هەرچی سامان و داراییت دەوێت، وەریبگرە. مەصعەب رازی نەبو و شەڕی دەستپێکرد. عەبدولەلیك کوڕی مەروان وتی: سوێند بەخوا ئەمە هاوشێوەی کەسێکە کە شاعیر دەڵێت:

و مدجج كره الكماة نزاله          لا ممعنا هربا و لا مستسلما

یانی: پیاوێکی شەڕکەر و سەراسەر کەرەستەی شەڕی پێیە کە شەڕکەران لەروبەروبونەوەی دەترسن، نەدەیەوێت رابکات و نەدەیەوێت تەسلیمی دوژمن ببێت.

مەصعەب رۆشتە ناو خێوەتەکانی خۆی و(حنوط)ی هەڵگرت و خێوەتەکانی روخاند و شەڕی دەست پێکرد. عوبەیداللە کوڕی زیاد کوڕی زەبییان هاتە لای و داوای روبەروبونەوەی لێکرد. مەصعەب پێی وت: ون بە ئەی سەگی گلاّو! کەسێکی هاوشێوەی تۆ روبەروی من نابێتەوە! مەصعەب هێرشی کردە سەری و بەشمشێر لێیدا کە خودەکەی شکاند و سەری بریندار کرد. ئەو گەڕایەوە و سەری بەست. خەڵکان مەصعەبیان بەتەنیا بەجێهێشت و هاوکاریان نەکرد بەشێوەیەك تەنیا حەوت کەس لەدەوری مانەوە. دوژمنەکان، مەصعەبیان تیرباران کرد و برینەکانی سەر جەستەی فراوان بون. هێرشی کردە سەر عوبەیداللە کوڕی زەبییان و بەشمشێر لێیدا بەلاّم نەیتوانی بیکوژێت چونکە برینەکانی زیادی کردبو. کوڕی زەبییان شمشێری لێدا و کوشتی.

دەستەیەك دەڵێن: بەو شێوە نەبو بەڵکو زاید کوڕی قودامەی سەقەفی سەیری کرد و بەرم لێیدا و وتی: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی موختار دەکەن! ئەو کەوتە سەرزەوی و عوبەیداللە کوڕی زەبییان سەری بڕی و بردیە لای عەبدولەلیك و وتی:

نعاطي الملوك الحق ما قصطوا لنا          و ليس علينا قتلهم بمحرم

یانی: تا ئەو کاتەی پاشاکان دادپەروەری لەناو ئێمەدا بکەن، دەیانپارێزین. بەلاّم کوشتنی ئەوان بۆ ئێمە ناڕەوا نیە.

کاتێك عەبدولمەلیك سەربڕاوەکەی بینی، سەری خستە سەرزەوی و نوێژی بۆ خوابرد و سوپاسی کرد بۆ ئەوەی دوژمنەکەی لەناو بردوە. کوڕی زەببیان وتی: کاتێك عەبدولمەلیك سەری خستە سەرزەوی، مەبەستی کوشتنی ئەوم کرد تا دو پاشا لەعەرەبەکانم کوشتبێت و زیانی ئەوانم لەخەڵکان دورخستبێتەوە. عەبدولمەلیك وتی: بڕیارمدا کوڕی زەببیان بکوژم تاخراپترین خەڵکم لەجیاتی بوێرترین پیاوی سەرزەوی کوشتبێت.

عەبدولمەلیك فەرمانیدا و هەزار دیناریان بەکوڕی زەببیان دا. وتی: مەصعەبم بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی تۆ نەکوشت بەڵکو لەجیاتی کوژرانی براکەم نابی کوڕی زیاد. ئەو دینارەکانی وەرنەگرت.

کوژرانی مەصعەب لە(دير الجاثليق) لەسەر کەنارەکانی روباری دوجەیل رویدا.

عەبدولمەلیك فەرمانیدا ئەو و کوڕەکەیان بەخاك سپارد. وتی: ئێمە لەکۆنەوە یەکترمان دەپاراست بەڵام بەداخەوە (پاشایەتی نەزۆکە).

هۆکاری کوژرانی براکەی ئەو نابی کوڕی زیاد کوڕی زەببیان بەمشێوە بو کەئەو و پیاوێك لەبەنی نەمیر چەتەیی وڕێگریان دەکرد و ئەم دوانەیان بردە لای موتەریف کوڕی سیدانی باهلی سەرکردەی پاسەوانەکانی مەصعەب کە نابی کوشت و لەنەمیریەکەی دا و ئازادی کرد. عوبەیدالله دەستەیەکی کۆکردەوە و مەبەستی موتەریفی کرد وئەمە دوای ئەوە بو کەمەصعەب ئەوی لەسەر کارەکەی لابردبو و وەك فەرمانداری ئەهواز دەستنیشانی کردبو. ئەو موتەریفی کوشت. مەصعەب، موکەرەم کوڕی موتەریفی بەدوای عوبەیدالله رەوانە کرد. ئەو بەرێکەوت تا گەیشتە سوپاکەی موکەرەم، ئەو چاوی بەسوپاکەی موکەرەم نەکەوت چونکە پەیوەستی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان ببو. سەبارەت بەکوژرانی ئەو ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکە داوە.

کاتێك سەری مەصعەبیان بردە لای عەبدولمەلیك، وتی: کەی ژنێکی قورەیشی دەتوانێت منداڵێکی وەك تۆی ببێت! ئەم دوانە لەمەدینە لەگەڵ ژنێك بەناوی (حوببی) قسەیان دەکرد. بەژنەکە وترا، مەصعەبیان کوشت. وتی: قوڕ بەسەر بکوژەکەی! پێیان وت: عەبدولمەلیك ئەوی کوشت. وتی: ئەی هاوار، باوکم بەقوربانی بکوژ و کوژراو بێت.

دواتر عەبدولمەلیك کوڕی مەروان پێشنیاری بەیعەتی بەسوپاکەی عێراق کرد

کەبەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەو بەرێکەوت تا گەیشتە کوفە و لەنوخەیلە ئوردوی لێدا و چل رۆژ مایەوە. لەکوفە وتارێکی پێشکەش کرد و مژدەی بەچاکەکاران بەخشی و خراپەکارانی ترساند و وتی: هێشتا ئەو زنجیرەی کردمە ملی مامم، لای خۆم پارێزراوە. سوێند بەخوا نایکەمە ملی هیچ پیاوێك مەگەر ئەوەی ملی لێبکەمەوە. هەرکەس ژیانی خۆی بپارێزێت و ئاگادار بێت لەخوێنی خۆیدا مەلە نەکات. ماڵئاوا.

پێشنیاری فەرمانبەری و بەیعەتی بەخەڵك کرد کەبەیعەتیان لەگەڵ بەست. قوزاعیەکان رۆشتنە لای. بەوانی وت: ئێوە خەڵکانێکی کەمن چون لەبەرابەر موزەریەکان خۆراگری دەکەن؟ (ویستی شەڕ لەنێوان قوزاعە و موزەر هەڵگیرسێنێت). عەبداللە کوڕی یەعلی نەهدی وتی: ئێمە لەوان بەرێزتر و پارێزراوترین و ئەمە بەهۆی تۆ و کەسانێك لەئێمەیە کە لای تۆن. دواتر خەڵکانی مێزحەج هاتن. وتی: بۆ کەس لەهاورێکانی ئەوان لەکوفە هیچ نابینم. دواتر خەڵکی جوعفی هاتن. وتی: خوشکەزاکەتان (یەحیا کوڕی سەعید) بێننە لای من. دایکی ژنێکی مێزحەجی بو. وتیان: ئەمانی هەیە؟ وتی: پەیمان لەمن وەردەگرن! پیاوێك لەوان وتی: ئێمە لەبەر ئەوە داوای پەیمان ناکەین کە رێزت ناگرین، دەمانەوێت لەخۆشەویستی باوکانەی خۆت بەئێمە ببەخشیت. وتی: چەندە خەڵکانێکی باشن! ئێوە لەرۆژگاری جاهلی و ئیسلام سوارکارانی شەردیتو بون و هەن. بیهێنن کە ئەمانی هەیە. ئەویان هێنا و بەیعەتی کرد. دوبارە خەڵکی عەدەوان هاتن. لەپێش خۆیانەوە پیاوێکی قۆزیان رەوانە کرد. عەبدولمەلیك وتی:

عذیر الحی من عدوا ن كانوا حیة الارض

بغی بعضهم بعضا فلم یرعوا علی بعض

و منهم كانت السادا ت و الموفون بالفرض

یانی: ئاگاداری هاورێی خەڵکەکەی خۆتان بن چونکە ئەوان بژاردەکان و هەڵبژێردراوەکانی هۆزەکەیان بون. ستەمیان لەیەك کرد و رێزی یەکیان نەگرت. سەرەوەران لەوان بون کەرێزییان لەپێویستیەکانی خۆیان گرت.

دواتر روی کردە ئەو پیاوە قۆزە و پرسی: ها! پیاو وتی: نازانم. مەعبەد کوڕی خالیدی جەدەلی کە لەپشت سەریەوە بو وتی:

و منهم حكم یقضی فلا ینقض ما یقضی

ومنهم من يجيز الحج          بالسنة و الفرض

و هم مذولدوا شبوا          بسر النسب المحض.

یانی: دەستەیەك لەوان داوەری دەكەن و فەرمان دەدەن بەشێوەیەك كەس ناتوانێت فەرمانەكەیان بشكێنێت. هەروەها كەسانێكن كەمەبەستی ماڵی خوا دەكەن چ ئەركی سەرشانیان بێت چ بیانەوێت وەك كارێكی چاكە ئەنجامی بدەن. لەوانن ئەو كەسانەی لەمناڵیەوە پیربون و ئەمە بەفەرزاری نەژادە پاكەكەی خۆیانن.

عەبدولمەلیك رویكردە ئەو پیاوە قۆزەو وتی: كێیت؟ وتی: نازانم. مەعبەد لەپشت سەریەوە وتی: (ذو الاصبع) (پەنجە براوە). پرسی بۆ بەپەنجە براو ناوت دەبەن؟ وتی: نازانم. مەعبەد وتی: چونكە مارێك پەنجەی گەست و قرتاندی. روی كردە پیاوە قۆزەكە و پرسی: پێشتر ناوت چی بو؟ وتی: نازانم. مەعبەد وتی: ناوی حەرسان كوڕی حارس بو. روی كردە پیاوە قۆزەكە وتی: ئەندازەی بەخششەكەی تۆ چەندە؟ وتی: حەوتسەد. بەمەعبەدی وت: ئەندازەی بەخششەكەی تۆ چەندە؟ وتی: سێسەد. بەدەبیرەكەی وت: چوارسەد بەبەخششەكەی مەعبەد زیاد بكە و چوارسەد لەم كەم بكەرەوە. ئەو كارەی كرد.

دواتر خەڵكی كێندە هاتن. سەیری عەبداللە كوڕی ئیسحاق كوڕی ئەشعەسی كرد و براكەی بشر كوڕی مەروان سەبارەت بەو پێشنیاری چاكەی كرد. داوود كوڕی قەحزەم لەگەڵ دەستەیەكی فراوان لەخەڵكانی بەكر كوڕی وایل گەیشتە لای. جل وبەرگی داوودیان لەبەردابو. بەو شێوەیە ناویان دەبرد. لەگەڵ عەبدولمەلیك لەسەر تەختەكەی دانیشت. عەبدولمەلیك روی تێكرد و دواتر هەستا و ئەوان هەستان. وتی: ئەی خەڵكی نابەكار، ئەگەر سەروەرەكەیان نەدەهاتە لام، كەسیان فەرمانیان لەمن نەدەبرد.

قەتەن كوڕی عەبداللەی حارسی وەك فەرمانداری كوفە دەستنیشان كرد. دوای ئەوە لایبرد و براكەی خۆی بشر كوڕی مەروانی كردە فەرماندار. دواتر محەممەد كوڕی عومەیری هەمەدانی كردە فەرمانداری هەمەدان و یەزید كوڕی رویەمی كردە فەرمانداری رەی. بەڵێنەكەی سەبارەت بەنیسفەهان بۆ هیچ كەسێك نەبردە سەر. وتی: بیانهێننە لای من ئەو خراپەكارانەی لەقولایی شامدا رۆچون و عێراقیان بەفیرۆدا. وتیان: سەروەری هۆزەكانیان ئەوانیان پەناداوە. وتی: كەس بوێری ئەوەی هەیە

لەبەرابەر من پەنا بەکەسانیتر بدات.

لەم کاتەدا ئەوان پەنایان بۆ ئەم کەسانە بردبو: عەبدالله کوڕی یەزید کوڕی ئەسەد باوکی خالیدی قەسری بەعەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس، یەحیا کوڕی مەعیوق هەمەدانی بە عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس، هوزەیل کوڕی زەفەر کوڕی حارس( کە پێشتر بەهەمان شێوە کەباسی دەکەین، لەگەڵ عەبدولەلیك بو) و عەمرۆ کوڕی یەزیدی حەکەمی پەنای بۆ خالید کوڕی یەزید بردبو. عەبدولەلیك ئەمانی پێبەخشین کە خۆیان ناشکرا کرد. دواتر عەمرۆ کوڕی حورەیس خۆراکێکی فراوانی بۆ عەبدولەلیك دروست کرد و ئەوی بۆ کۆشکە ناودارەکەی خۆی (خورنەق) بانگێشت کرد و سفرەی بۆ خەڵك راخست و خەڵك هاتن و لەشوێنەکانی خۆیان دانیشتن. عەمرۆ کوڕی حورەیس هاتەژوور. عەبدولەلیك رێزی لێگرت و لای خۆی لەسەر تەختەکەی داینیشاند. دواتر سفرەکانیان بلاّو کردەوە و خەڵك نانیان خوارد و تێربون. عەبدولەلیك لەخۆشیدا وتی: چەندە شیرینە ژیانی ئەمرۆمان ئەگەر هەمیشەیی بێت. بەلاّم ئێمە بەو شێوەیەن کە شاعیر وتویەتی:

اعمل على مهل فانك ميت     و اكدح لنفسك ايها الانسان

فكان ما قد كان لم يك اذ مضى     و كان ما هو كاين قد كان

یانی: بەهێواشی بۆ خۆت کار بکە چونکە تۆ دەمریت، بۆ خۆت تێبکۆشە ئەی مرۆڤا دەڵێی ئەوەی بوە، نەبوە چونکە بەسەر چوە  ودەڵێی ئەوەی هەیە، لەئەنجامی ئەوەدایە کە دەڵێن: بوە.

کاتێك عەبدالله کوڕی خازم ناگادار بویەو کە مەصعەب مەبەستی شەڕ لەگەڵ عەبدولەلیك کوڕی مەروانی هەیە، وتی: ئایا موهەلیب هاوڕێیەتی؟ وتیان: نا، ئەوی بۆ شەڕی خەواریج رەوانە کردوە. وتی: ئایا عەباد کوڕی حوصەین لەگەڵیەتی؟ وتیان: ئەوی کردۆتە فەرمانداری پارس. وتی: ئایا عومەر کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر لەگەڵ ئەودایە؟ وتیان: نا ئەوی رەوانەی پارس کردوە. وتی: منیش لەخوراسانم.

خذيني فجريني جعار و ابشري     بلحم امرى لم يشهد اليوم ناصرة

یانی: ئەی جەعار، من بگرە و بمکوژە و مژدەت لێ بێت بەگۆشتی پیاوێك کە لەشەڕی ئەمڕۆ هاوڕێکانی لەگەڵی نەبون.

کاتێك مەصعەب کوژرا، عەبدولەلیك سەری ئەوی بۆ کوفە رەوانە کرد یا خۆی بۆ ئەوێی برد ( و لەکۆشك دانیشت و لەبەردەم خۆی داینا ونیشانی خەڵکانی دەدا) دواتر سەری مەصعەبی بۆ عەبدولعەزیز کوڕی مەروان لەمیسر رەوانە کرد.

کاتێك بینی شمشێر لوتی بڕیوە، وتی: خوا لێت خۆش بێت، لەهەمویان روخۆشتر، بوێر و بەخشندەتر بویت. دواتر رەوانەی دیمەشقی کرد کە هەڵیانواسی. ویستیان بەناوچەکانی شامدا بیگەرێنن، عاتیکە کچی یەزید کوڕی معاویە ژنی عەبدولەلیك کوڕی مەروان هەڵیگرت و شۆردی و بەخاکی سپارد و وتی: ئایا بەوەی کردتان، رازی نەبون؟ مەگەر ئێوە نەتانکوشت؟ ئایا ئێستا دەتانەوێت بەشارەکاندا بیگێڕن؟

کاتێك مەصعەب کوژرا، تەمەنی سی و شەش ساڵ بو.

رۆژێك عەبدولەلیك بەهاونشینەکانی خۆی وت: خۆڕاگرترینی خەڵکان کێیە؟ وتیان: سەروەری باوەڕداران. وتی: شتێك جیاواز لەمە. وتیان: عومەیر کوڕی حوباب. وتی: خوا عومەیر فێزمون بکات! چەتەیەکی رێگر بو، کراسێك کە لەسەر ئەو کراسە شەڕی لەگەڵ کەسانێتر دەکرد، لەدین و گیانی خۆشەویستتربو. وتیان: شبیبی خارجی. وتی: حروریەکان رێگەیەکیان هەیە. وتیان: ئەی کێیە؟ وتی: مەصعەب کوڕی زوبەیر. دو بیرمەند خاتونی قوڕەیش هاوسەری ئەو بون: سوکەینە کچی حسین کوڕی عەلی و عایشە کچی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله. جیاواز لەوە، لەهەموان زاناتر بو. ئەمانم پێ بەخشی وپێشنیاری فەرمانداری عێراقم پێکرد و دەیزانی بەڵێنەکەی خۆم دەبەمە سەر، چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر هاوڕێ بوین. ئەو سەری خۆی بەرز راگرت و رازی نەبو و کوشتاری کرد تا کوژرا. پیاوێك وتی: مەصعەب شەرابی دەخواردەوە. وتی: پێش ئەوەبو بەدوای ناو و ناوبانگدا بگەرێت. بەلاّم لەو کاتەوە، ئەگەر گومانی ئەوەی دەکرد کە ئاو ناو و ناوبانگەکەی دەزرێنێت، لێوی بۆ نەدەبرد.

ئەقشەری ئەسەدی وتی:

| | |
|---|---|
| حمى انفه ان يقبل الضيم مصعب | فمات كريما لم تذم خلائقة |
| و لوشاء اعطى الضيم من ارم هضمه | فعاش ملوما فى الرجال طرائقة |
| و لكن مضى و البرق يبرق خاله | يشاوره مرا و مرا يعانقة |
| فولى كريما لم تنله مذمة | و لم يك رغدا طيبته نمارقه |

یانی: مەصعەب لەوە خۆی بەدور دەگرت بەستەم رازی ببێت. لەبەر ئەمە وەك رێزادرێك مرد وسەرکۆنە نەکرا. ئەگەر دەیویست، دەیتوانی بەریسوایی و پەستی رازی ببێت بەشێوەیەك هەمو خەڵکان سەرکۆنەی بکەن. بەڵام رۆشت و هەورەبروسکە هاورێ بو کەهەندێ کات لێی جیادەبونەوە و هەندێ کات خۆیان بەملیەوە هەڵدەواسی. لەم جیهانە بەشێوەیەکی رێزدار کۆچی کرد بەشێوەیەك ریسوایی لەو دەرنەکەوت. خۆشگوزەران و ئاسایش خواز نەبو کە سەرینە نەرمەکانی بۆ دابنێن.

عەرفەجە کوڕی شەریك وتی:

ما لابن مروان اعمی الله ناطرة      و لا اصاب رغیبات و لا نفلا

یرجو الفلاح ابن مروان و قد قتلت      خیا ابن مروان حرا ماجدا بطلا

یا ابن الحواری کم من نعمة لکم      لورام غیرکم امثالها شغلا

حملتهم فخملتم کل معضلة      ان الکریم اذا حملته حملا

یانی: کوڕی مەروان چی بەسەر دێت خوا چاوی کوێر بکات و بەهیچ کام لەئارەزووەکانی شادی نەکات، کوڕی مەروان هیوای رزگاری هەیە لەکاتێکدا سوارەکانی ئەو پیاوێکی ئازاد ورێزدار و گەورەیان لەخاك و خوێندا گەوزاند. ئەی کوڕی هاورێی جیانەبوەوەی پێغەمبەر، پێگەتان چەندە بەرز بو، ئەگەر کەسێك جگە لەئێوە خوازیاری ئەو پێگەدەبو، گرفتار دەمایەوە. هەر کارێکی دژوار بخەنە ئەستۆی ئێوە، ئێوە بەدروستی بەئەنجامتان گەیاند. رێزدار کەسێکە کاتێك بارێکی قورسی دەخەنە سەرشان، تا کۆتایی رێگە بیبات.

عەبدالله کوڕی زەبیری ئەسەدی سەبارەت بەئیبراهیم کوڕی ئەشتەر وتی:

سابکی و ان لم تبك فتیان مذحج      فتاها اذا اللیل التمام تاوبا

فتی لم یکن فی مرة الحرب جاهلا      و لا بمطیع فی الوغی من تهیبا

ابان انوف الحی قحطان قتله      و انف نزار قدابان فاوعبا

فمن یك امسی خائنا لامیرة      فما خان ابراهیم فی الموت مصعبا

یانی: هەرچەندە گەنجەکانی مەزحەج بۆ جوامێرەکەی خۆیان نەگرین، من شەوی درەنگ کە بەرەو رەشی دەڕوات، بۆ ئەو دەگریم. جوامێرێك کە لەگەرماوگەرمی شەڕ، نەزان و بێ مێشك نەبو و بەگومڕایی، لایەنگری لەگومڕاکان نەدەکرد. کوژرانی ئەو

لوتی خەڵکی قەحتانی لەزەویدا و لوتی خەڵکی نزاریش. هەرکەس خیانەتی لەڕێبەرەکەی خۆی کردبێت، ئیبراهیم خیانەتی لەمەصعەب نەکرد.

کاتێك مەصعەب کوژرا، موهەلیب لەسولاف، لەشارەکانی پارس، سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ خەواریج بو. سولاف لەکەنار دەریایە. ئەو هەشت مانگ بەوانەوە گرفتار بو. ئەزرەقیەکان پێش موهەلیب لەکوژرانی مەصعەب ئاگاداربونەوە. ئەوان بانگی یارانی موهەلیبان کرد: ئەندێشەتان سەبارەت بەمەصعەب چیە؟ وتیان: فەرمانڕەوایەکی رزگاربوە و سەرورەی ئێمە لەم جیهان و لەو جیهانە و ئێمە شوێنکەوتەکانی ئەوین. وتیان: سەبارەت بە عەبدولەلیك کوڕی مەروان چی دەڵێن؟ وتیان: کوڕی پیاوێکی نفرین کراوە و خوێنی ئەو لەخوێنی ئێوە بۆ ئێمە ڕەواترە. وتیان: کەواتە بزانن کە عەبدولەلیك مەصعەبی کوشت و ئێوە بەناچار بەیانی عەبدولەلیك وەك ڕێبەری خۆتان دەناسن. کاتێك بەیانی بویەوە، موهەلیب و هاورێکانی بیستیان کە مەصعەب کوژراوە. موهەلیب بەیعەتی لەخەڵك بۆ عەبدولەلیك وەرگرت. خەواریج پێیان وتن: ئەی دوژمنانی خوا! ئەو کاتەی فەرمانڕەوای ئێمە بو، بەو رازی بوین و ئەمڕۆ ئەم ڕێگا دەگرینەبەر. وتیان: نا سوێند بەخوا ئێوە شوێن کەوتەکانی شەیتان و کۆیلەکانی ئەم جیهانەن.

بەڵام عەبدالله کوڕی زوبەیر، کاتێك هەواڵی مەرگی براکەی بیست، لەناو خەڵکدا وتارێکیدا:

سوپاس بۆ خوایەك شیاوە کە ئافراندن و کارەکان لەدەستی ئەودایە. بەهەر کەس بخوازێت، پاشایەتی دەبەخشێت و لەهەر کەس بخوازێت، وەریدەگرێتەوە. کەسێك راستی و دروستی بگرێتەبەر، خوا ریسوایی ناکات هەرچەندە تەنها بێت و کەسێك هاورێی شەیتان بێت، ڕێزداری ناکات هەرچەند هەمو خەڵکی لەگەڵدا بێت. بزانن، لەعێراقەوە هەواڵێکمان پێگەیشتوە کە هەم خەمباری کردین هەم شادمان. هەواڵی کوژرانی مەصعەب گەیشت، خوا لێی خۆش بێت. ئەوەی شادمانی کردین، ئەوەیە بێ گومان دەزانین کوژرانی ئەو گیان بەخشین بو، بەڵام ئەوەی خەمباری کردین ئەوەیە کە جیابونەوەی هاورێیەکی بەرێز، گەرمیەکی سوتێنەری هەیە کە دواهاتەکەی بیرمەندی خۆڕاگر بۆ دڵنەوایی و خۆڕاگری هان دەدات. مەصعەب تەنیا بەندەیەك بو لەبەندەکانی

خوا و یارێك لەناو یارانم. عێراقیە دوروو و فریوبازەکان ئەویان بەجێهێشت و بەکەمترین بەها فرۆشتیان. ئەگەر کوژرا، ئاگاداربە! ئێمە هاوشێوەی بنەماڵەی ئەبو عاص لەسەر جێگەی نەرم نامرین. سوێند بەخوا یەك کەس لەوان لەشەڕەکانی سەردەمی جاهلی و ئیسلام نەکوژرا. مەرگی ئێمە تەنیا لەسێبەری شمشێر و ڕمەکاندایە. دنیا جل وبەرگێکە بۆ رۆژگارێکی کورت و تێپەڕ کەلەپاشای گەورە بەخەڵکی سەر زەوی بەقەرز دەدرێت. ئەوە کە پاشایەتیەکەی بێ کۆتایی و فەرمانڕەوایەتیەکەی بەرزتر لە لەناوچونە. ئەگەر جیهان باوەش بۆ من بکاتەوە، بەخۆشحاڵیەوە لەئامێزی ناگرم و ئەگەر پشتم تێبکات، هاوشێوەی گرینۆکەکان بەدوایدا ناگریم. ئەمە دەڵێم و لەخوا، بۆ خۆم و ئێوە داوای لێخۆشبون دەکەم.

## فەرمانداری خالید کوڕی عەبداللە لەبەسرە

لەم ساڵەدا حیمران کوڕی ئەبان و عوبەیداللە کوڕی ئەبی بەکرە لەسەر فەرمانداری بەسرە شەڕیان لەگەڵ یەك کرد. کوڕی ئەبی بەکرە وتی: من لەتۆ گەورەترم، لەشەری جوفرە سامانم بۆ یارانی خالید خەرج کرد. بەحیمرانیان وت: تۆ ناتوانیت لەبەرابەر کوڕی ئەبی بەکرە خۆڕاگری بکەیت، داوای هاوکاری لە عەبداللە کوڕی هەیسەم بکە. داوای هاوکاری لێکرد. بەسەر بەسرەدا زاڵ بو و عەبداللە فەرماندەی پاسەوانەکان بو. حیمران لای ئومەییەکان پێگەیەکی هەیە. ئەم شەڕ و بگرە وبێنە دوای کوژرانی کوڕی زوبەیر بو.

کاتێك عەبدولمەلیك دوای کوژرانی ئەو بەسەر عێراقدا زاڵبو، خالید کوڕی عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسیدی کردە فەرمانداری بەسرە. خالید عوبەیداللەی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. کاتێك حیمران گەیشت، وتی: هاتی کە بەخێر نەهاتیت! عوبەیداللە فەرماندار بو تا خالید گەیشت.

کاتێك عەبدولمەلیك لەعێراق تەواوبو، بۆ شام گەڕایەوە.

## کاری عەبدولمەلیك و زەفەر کوڕی حارس

لەکاتی گێرانەوەی شەڕی مەرج راهیت ئاماژەمان بەوەدا کەزەفەر چۆن رۆشتە قرقیسیا، بۆ قەیسیەکان لەدەوری کۆبونەوە و چۆن بەسەر ئەواندا زاڵ بو و دواتر دەرئەنجامی کارەکانی بەکوێ گەیشت. ئەوبەیعەتی کوڕی زوبەیر لەملدا بو و فەرمانی لەو دەبرد. کاتێك مەروان کوڕی حەکەم مرد و کوڕی عەبدولمەلیك هاتەسەر کار، بۆ ئەبان کوڕی عوقبە کوڕی ئەبی موعیت نامەیەکی نوسی و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر زەفەر. ئەو فەرمانداری حمص بو. بەرێکەوت و فەرمانی پێشەنگەکانی عەبدالله کوڕی زمیتی تایی بو. عەبدالله پێش گەیشتنی ئەبان شەڕی لەگەڵ زەفەر دەستپێکرد و نزیکەی سێسەد پیاوی شەڕکەر لەسوپاکەی کوژرا. ئەبانی بۆ پەلە کردنەکەی سەرکۆنەی کرد و شەڕی لەگەڵ زەفەر کرد و کوڕەکەی وەکیع کوڕی زەفەری کوشت. خەڵکانی تایی دەستدرێژیان کردە سەر ژنان و سامانی خەڵکەکەی زەفەر و رفاندیان. محەممەد کوڕی حوصەین کوڕی ئەمیر بەتکاکاری ژنەکانی لەوان وەرگرتەوە و گەڕاندیەوە بۆ قرقیسیا. زەفەر وتی:

علقن بحبل من حصين لو انه      تغيب حالت دونهن المصائر

ابوكم ابو نافى القديم و اننى      لغابر كم فى اخر الدهر شاكر

یانی: ژنان بەتەنافەکی حوصەین خۆیان هەڵواسی چونکە ئەگەر ئەو نەدەبو چارەنوسیان دەبوە رێگریان. باوکتان لەرۆژگاری کۆن باوکی ئێمە بو و من لەکۆتایی رۆژگار لەهەمو پێشنیان و داهاتوانی ئێوە سوپاسگوزارم.

سەبارەت بەزەفەر وتراوە کە ئەژادەی دەگەڕایەوە بۆ کێندە.

کاتێك عەبدولمەلیك مەبەستی مەصعەبی کرد، رۆشتە قرقیسیا و لەوێ گەمارۆی خستە سەر زەفەر کوڕی حارس کەشنکەنجیریان هەڵبەست. زەفەر فەرمانیدا و لەناو سوپاکەی عەبدولمەلیك هاواریان کرد: بۆ کەشنکەنجیرتان هەڵبەستوە؟ وتیان: بۆ ئەوەی کەلێنێك دروست بکەین و لەو رێگەوە شەڕ لەگەڵ ئێوە بکەین. زەفەر وتی: پێیان بڵێن لەپشت دیوارەکانەوە شەڕ لەگەڵ ئێوە ناکەین بەڵکو روبەروتان دەبینەوە. کەشکەنجیرەکان لەشار لەشوێنی حورەیس کوڕی بەجدەل کەلێنیان دروست کرد. زەفەر وتی:

لقد تركتنى منجنيق ابن بجدل      احيد عن العصفور حين يطير

یانی: بەردهاوێژەکانی کوڕی بەجدەل کارێکیان لەگەڵ من کرد کە کاتێك باڵندەیەك بەسەرسەرمەوە هەڵفڕێت، بترسم و خۆم بکێشمە لاوە.

خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان هەوڵیدەدا. پیاوێك لەیارانی زەفەر لەبەنی کەلاب وتی: قسەیەك بەخالید دەڵێم تا چیتر هێرش نەکاتە سەرمان. کاتێك بەیانی بویەوە، خالید بۆ شەڕ هاتەدەر و کەلابی پێی وت:

ماذا ابتغاء خالد و همه          اذ سلبت الملك و نيكت امه

یانی: ئەم هەمو هەوڵەی خالید بۆ چ مەبەستێکە؟ پاشایەتیان لەدەستی دەرهێنا و دایکیان گا.

خالید شەرم دایگرت و چیتر بۆ شەڕی ئەوان نەهاتەدەر.

خەڵکانی کەلب بە عەبدولمەلیکیان وت: کاتێك ئێمە روبەروی زەفەر بوینەوە، ئەو دەستە لەخەڵکانی قەیس کە دەتوانن رابکەن، تێکەڵ بەئێمە بکە. رازی بو. خەڵکانی قەیس لەسەر تیرەکانی خۆیان نوسیان: بەیانی هیچ کەس لەخەڵکانی موزێر شەڕ لەگەڵ ئێوە ناکات. تیرەکانیان بۆ قرقیسیا هاویشت. کاتێك بەیانی بویەوە، زەفەر کوڕەکەی هوزەیلی بانگ کرد و وتی: بەشێوەیەك هێرش بکەرە سەریان کەنەگەڕێیتەوە تا خێوەتەکەی عەبدولمەلیك بەسمی ئەسپەکانی خۆت دەشێلیت. سوێند بەخوا ئەگەر بگەڕێیتەوە بێ ئەوەی خێوەتەکانی ئەوت پێشێل کردبێت، بێ چەند و چون دەتکوژم. هوزەیل سوارەکانی خۆی کۆکردەوە و هێرشی برد. کەمێك خۆڕاگریان کرد و دواتر پاشەکشێیان کرد. هوزەیل شوێنیان کەوت و سوارەکان بەدوای ئەودا تا ئەوەی تەناف خێوەتەکەی عەبدولمەلیکیان بەسمی ئەسپەکانی خۆیان شێلا و بەشێك لەتەنافەکانیان بڕی. دواتر گەڕانەوە. زەفەر سەری هوزەیلی ماچ کرد و وتی: لەمەدوا تا هەمیشە عەبدولمەلیك تۆی خۆش دەوێت. هوزەیل وتی: سوێند بەخوا ئەگەر مەبەستی ئەوەم دەکرد هێرش بکەمە ناو خێوەتەکەی، دەمتوانی. زەفەر وتی:

الا لا ابالى من اتاه حمامه          اذا ما المنايا عن هذيل تجلت

تراه امام الخيل اول فارس          و يضرب فى اعجازها ان تولت

یانی: سوێند بەخوا ئەگەر مەرگ چنگی خۆی لەهوزەیل دوربخاتەوە، ترسم نیە کە هەر کەسێکیتر پێی گرفتار ببێت. ئەو لەپێش سوارەکان لەرۆژی شەڕدا دەبینیت و کاتێك

دوژمنان رادەکەن، شوێنیان دەکەوێت و رەگ و ریشەی ئەوان لەناو دەبات.

کاتێك دیوارەکەی قرقیسیا کەلێنی تێ کەوت، یەکێك لەکەسانی عەبدولەلیك پێی وت: ئەگەر خەڵکی قوزاعە بۆ شەڕی ئەوان رەوانە بکەیت، سەرکوتیان دەکەیت. ئەم کارەی کرد و شەڕی لەگەڵ ئەوان ئەزمون کرد. کاتێك ئێواری داهات، خەڵکاتی قوزاعە تێکشکان و کوژراوەکان لەناو ئەوان زیادی کرد. روەح کوڕی زەنباعی جوزامی روی کردە یەکێك لەپێگە دیدەوانیەکان و پرسی: سوێندتان دەدەم بەخوا، ئایا کەسمان لەئێوە کوشت؟ وتیان: سوێند بەخوا کەس لەئێمە نەکوژرا. تەنیا یەك بریندارمان هەبو کە ترسی لەسەر نیە. دواتر وتیان: ئەی ئێمە چەند کەس لەئێوەمان کوشت؟ وتی: سوارانێکی زۆرتان کوشت و کەسانێکی زۆرتان بریندار کرد. خوا کوڕی بەحجەل نفرین بکات.

روەح کوڕی زەنباع بۆ لای عەبدولەلیك گەڕایەوە وتی: کوڕی بەحجەل بەردەوام بەڵێنی هیچ بەتۆ دەدات، خۆت لەم پیاوە بەدور بگرە.

لەم کاتەدا پیاوێك لەخەڵکانی کەلب بینرا کەپێیان دەوت زەمیال: دەهاتەدەر و جوێنی بەزەفەر کوڕی حارس دەدا و سنوری دەبەزاند. زەفەر بەکوڕەکەی هوزەیل یا کەسێکیتری وت: ئەوە لەناو نابەیت؟ وتی: دەیهێنمە لای تۆ. ئەو شەوانە ڕۆشتە ناو سوپاکەی عەبدولەلیك و هاواری کرد: کێیە ئێسترێك بەم تایبەتمەندیانە بناسێت؟ سەرئەنجام گەیشتە خێوەتی ئەو پیاوە و ناسیەوە. پیاو وتی: هیوادارم خوا ونبوەکەت بۆ تۆ بگەڕێنێتەوە. وتی: ئەی بەندەی خوا، هیلاکم، ئەگەر ئیزن بدەیت دێمە ژوور تا کەمێك بحەوێمەوە. وتی: وەرە ژوور. ڕۆشتە ژوور و بینی پیاوەکە تەنیایە. خۆی خستە سەرزەوی و خاوەنی خێوەتەکە خەوت. هەستا و بەئاگای هێنایەوە. پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر یەك وشە بێنیتە سەرزمان، سەرت دەبڕم یا جەرگت هەڵدەدرم. وتی: ئەگەر بکوژرێم یا بەسلامەتی رزگارم بێت، تۆ چ سودێك لەکوژرانی من دەبەیت؟ وتی: ئەگەر بێدەنگ بیت و لەگەڵ من بۆ لای زەفەر بێیت، پەیمان و سوێندت بۆ دەخۆم تۆ بۆ ناو سوپاکەت بگەڕێنمەوە و جیاواز لەوە زەفەر دڵنەواییت بکات و پاداشت پێ ببەخشێت. ئەو دوانە هاتنەدەر و ئەو پیاوە بەردەوام هاواری دەکرد: کێیە ئێسترێك بەم تایبەتمەندیانە بناسێت؟ سەرئەنجام لەگەڵ ئەو پیاوە ڕۆشتە لای زەفەر. زەفەر چەند دینارێکی پێدا و جل وبەرگی ژنانی لەبەر کرد و سوار مایینێکی کرد ولەگەڵ پیاوێك

ڕەوانەی کرد تا گەیشتنە ناو سوپاکەی عەبدولەلیك. پیاوەکە هاواری کرد: ئەمە کەنیزێکە کە زەفەر بۆ عەبدولەلیکی ڕەوانە کردوە. ئەو پێکەنی و وتی: خوا دور نەخاتەوە ئەو پیاوەی کینەی دڵی خۆی وەرگرت. سوێند بەخوا کوشتنی ئەوان هۆکاری ڕیسواییە و ئازاد کردنیان هۆکاری شەرم و داخ خواردن. پیاوەکەی بەرەڵا کرد وگەڕایەوە. پیاوەکە لاڵ بو وچیتر جوێنی بەزەفەر نەدا. دەستەیەك دەڵێن: لەناو سوپاکە رایکرد.

دواتر عەبدولەلیك فەرمانی بەمحەممەدی برایدا تا پێشنیاری ئەمان بەزەفەر و کوڕەکەی بکات: بۆ گیانی خۆیان و هاوڕێکانیان و سامانەکەیان. جیاواز لەوە، هەر شتێك کەبیانەوێت لەوان درێغ نەکرێت. محەممەد ئەو کارەی کرد و هوزەیل ڕازی بو و بەباوکی وت: باشترە ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەم پیاوە بگریتەبەر چونکە زۆرینەی خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ بەستوە و ئەو بۆ تۆ باشترە لەکوری زوبەیر. زەفەر ڕازی بو لەسەر ئەو بنەمای لە هەر شوێنێك بیەوێت، نیشتەجێ ببێت و لەشەڕ دژی کوڕی زوبەیر هاوکاری عەبدولەلیك نەکات، لەم کاتەدا کە نێردراوان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد، پیاوێك لەخەڵکانی کەلب هاتە لای عەبدولەلیك و ئاگاداری کردەوە کەچوار بورجیتر دارماوە. عەبدولەلیك بەنێردراوەکانی وت: لەگەڵ ئەوان ئاشتی ناکەم. پێشرەوی کرد و سوپاکەی زەفەر ئەوانیان تێکشکاند و پاشەکشێیان پێکردن. عەبدولەلیك بەیارانی خۆی وت: هەرچیان دەوێت، پێیان بدەن. زەفەر وتی: ئەگەر پێشتر ئەو کارەتان دەکرد بۆتان باشتر بو. ئاشتی لەسەر ئەو بنەمایە سەقامگیر بو کە هەمویان ئەمان ببەخشرێن و خوێن و سامانەکان لەهەدولا پشت گوێ بخرێن و زەفەر تاکاتی مردنی کوڕی زوبەیر بەیعەت لەگەڵ عەبدولەلیك نەکات و ئەندازەیەك لەسامانی پێ ببەخشن تا لەناو هاوەڵانی خۆی دابەشی بکات.

زەفەر ترسا عەبدولەلیك فریوی بدات بەهەمان شێوە کەپەیمانەکەی لەگەڵ عەمرۆ کوڕی سەعید خستە ژێر پێ. نەڕۆشتە لای. عەبدولەلیك قامچیەکەی پێغەمبەری وەك نیشانەی ئەمان ڕەوانە کرد و زەفەر ڕۆشتە لای. کاتێك ڕۆشتە ژوور، عەبدولەلیك ئەوی لای خۆی لەسەر تەختەکەی دانیشاند. کوڕی عەزا ئەشعەری وتی: من بۆ ئەو جێگە خۆشە لەو شیاوتر بوم. زەفەر وتی: درۆت کرد. من دوژمنیم کرد و زیانم بەرکەوت و تۆ

هاوڕێیەتیت هەڵبژارد و سودت برد.
کاتێك عەبدولمەلیك بینی سوپاکەی کەمن، وتی: ئەگەر دەمزانی ئەم سوپاکەمە هاوڕێیەتی دەکات، بۆ هەمیشە گەماڕۆم دەخستەسەر تا ملکەچی فەرمانەکانی من بێت. ئەم وتارە بەگوێی زەفەر کوڕی حارس گەیشت. وتی: ئەگەر بتەوێت، بگەڕێرەوە و دەگەڕێینەوە. وتی: پێبەندی پەیمانەکەی خۆمم ئەی باوکی هوزەیل.
ڕۆژێك عەبدولمەلیك پێی وت: بیستومە ئەژادی تۆ بۆ کێندە دەگەڕێتەوە. زەفەر وتی: چ سود لەپیاوێك کە ڕژدی نەبات و خوازیاری مەبەستێکی گەورە نەبێت.
موسلیمە کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ ڕەباب کچی زەفەر پەیوەندی هاوسەری بەست. دوای ئەوە هوزەیل و کەوسەر (دوبرای ئەو کچە) بۆ ڕۆشتن بۆ لای خەلیفە پێش کەسانیتر ئیزنیان دەدرا.
زەفەر فەرمانی بەهوزەیلی کوڕی دا کە لەگەڵ عەبدولمەلیك بۆ شەڕی مەصعەب بڕوات. پێی وت: تۆ هیچ پەیمانێکت لەئەستۆدا نیە. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، خۆی لەمەصعەب نزیك کردەوە و پەیوەستی ئەو بو و شان بەشانی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر شەڕی کرد. کاتێك کوڕی ئەشتەر کوژرا، هوزەیل لەکوفە خۆی داشارد تا لە عەبدولمەلیك ئەمانیان بۆ وەرگرت. ئەو ئەمانی وەرگرت و ژیانی بەخۆشی بردە سەر.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك دەستی بەسەر قیساریەدا گرت. ئەمە بەپێی گێڕانەوەی واقدیە.
هەروەها لەم ساڵەدا کوڕی زوبەیر جابر کوڕی ئەسوەد کوڕی عەوفی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و تەڵحە کوڕی عوبەیدالله‌ی لەجێگەی ئەودانا. ئەمە دوایین فەرمانداری کوڕی زوبەیر لەمەدینە بو. سەرئەنجام تارق کوڕی عەمرۆ کۆیلەی عوسمان هێرشی کردە سەری و تەڵحە رایکرد و تارق لەوێ مایەوە و دواتر بۆ شەڕ لەگەڵ کوڕی زوبەیر ڕەوانەی مەککە بو.
لەماوەی فەرمانڕەوای مەصعەب ئەم کەسانە مردن: بەرائ کوڕی عازب لەکوفە، یەزید کوڕی موفەرغی حیمیەری شاعیر لەکوفە، عەبدالله کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی لەشەڕکەرانی خەیبەر و حودەیبیە، شەتیر کوڕی شەکلی قەیسی کوفی لەیارانی عەلی و کوڕی مەسعود.

## روداوەکانی ساڵی حەفتاو دوی کۆچی ( ٦٩١ زایینی )

## بەسەرهاتی خەواریج

کاتێك دوای کوژرانی مەصعەب کوڕی زوبەیر، عەبدولەلیك لەکوفە ئارامی گرت، خالید کوڕی عەبداللەی کردە فەرمانداری بەسرە. کاتێك خالید ڕۆشتە ئەم شارە، موهەلیب سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ ئەزرەقیەکان بو. خالید ئەوی کردە سەرپەرستی دامەزراوەی باجی ئەهواز و کۆکردنەوەی هێز. ئەو براکەی عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللەی بۆ شەڕ لەگەڵ خەواریج دەست نیشان کرد و موقاتیل کوڕی میسمەعی بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد. ئەم دوانە هاتنەدەر و مەبەستی گیانی ئەزرەقیەکانیان کرد. هەروەها قەتەری کوڕی فەجانەی مازنی لەگەڵ صالح کوڕی موخاریقی هاورێ لەگەڵ نۆسەد شەڕکەر رەوانە کرد. ئەو لەگەڵ ئەوان بەڕێکەوت تا پێشوازی لەعەبدولعەزیز کرد و ئەو ئارام وبێ خۆ ئامادە کردن بۆ شەڕ بۆ پێشەوە دەرۆشت. بەناچار ئەو و خەڵکەکەی گرفتاری شکەست بون. موقاتیل کوڕی میسمەع هات و کوشتاری کرد تا کوژرا. عەبدولعەزیز شکستی خوارد و هەڵات و ژنەکەی کچی مونزەر کوڕی جارود ئەسیر کرا و ئەوان بۆ فرۆش دایاننا تا هەر کەسێك بەهای زیاتر بدات، دەستدرێژی بکاتەسەر. بەهای ئەم ژنە بۆ سەد هەزار درەم بەرز بویەوە. پیاوێك لەهۆزی خودی ئەو ژنە لەخەواریج کە لەرێبەرانی ئەوان بو، هات ووتی: ئەمە کردارتانە. گومانم نیە ئەو ژنە بتپەرستە ئێوەی فریوداوە! ئەو ژنەی سەربڕی وبۆ بەسرە کۆچی کرد. بنەماڵەی مونزەر ئەویان بینی و وتیان: نازانین سەرکۆنەت بکەین یا وەسف! ئەو بەردەوام دەیوت: ئەوم لەبەر پیاوەتی و ڕژدی کوشت.

عەبدولعەزیز ڕۆشتە رامهورموز و هەواڵی ئەم کارە بەموهەلیب گەیشت. ئەو پیرێك لەخەڵکی ئەزدی رەوانە کرد و وتی: ئەگەر شکستی خواردبو، دڵنەواییبکە. پیاو هات و ئەوی بینی لەگەڵ سی سوار دابەزیوە و تێکشکاو و خەمبارە. پەیامی گەیاند و بەهەواڵەوە بۆ لای موهەلیب گەڕایەوە. موهەلیب کەسی بۆ لای عەبداللە برای رەوانە کرد و لەهەواڵەکان ئاگاداری کردەوە. ئەو بەنێردراوی وت: درۆت کرد. وتی: سوێند

بەخوا درۆ ناکەم، ئەگەر درۆزن بم، بمکوژە و ئەگەر راستگۆبوم، جل و بەرگ و زرێ گرانبایەکەی خۆت بەمن ببەخشە. وتی: لە زیانێکی گەورە بەپاداشێکی کەم بەسەلامەت کرد.

کوڕی قەیسی روقیات سەبارەت بەهەڵاتنی عەبدالله و بەجێهێشتنی ژنەکەی وتی:

| | |
|---|---|
| عبد العزيز فضحت جيشك كلهم | و تركتهم صرعى بكل سبيل |
| من بين ذى عطش يجود بنفسه | و ملحب بين الرجال قتيل |
| هلا صبرت مع الشهيد مقاتلا | اذرحت منتكث القوى باصيل |
| و تركت جيشك لا امير عليهم | فارجع بعار فى الحيوة طويل |
| و نسيت عرسك اذ تقاد سبية | تبكى العيون برنة و عويل |

یانی: ئەی عەبدولعەزیز، سوپاکەی خۆتت ریسوا کرد و ئەوانت لەهەر سوچ و قوژبنێکدا لەخاك و خوێندا بەجێهێشت. یەکێك تینو بو و گیانی دەدا ویەکێك بەدژواری هەوڵی دەدا و شمشێری دەوەشاند. بۆ لەگەڵ ئەو پیاوە گیان بەخشە خۆڕاگریت نەکرد. لەکاتی نوێژی ئێواریێ لەگەڵ هێزە پەرژوبڵاوەکەت هەڵاتیت. سوپاکەی خۆتت بێ فەرماندە کرد. ئێستا بەنەنگێکی هەمیشەیی بۆ ژیان بگەرێرەوە. ژنە گەنجەکەی خۆت رادەستی دوژمنان کرد کەوەك ئەسیرەکان بەملاولایدا بەرن، بەشێوەیەك چاوەکان بەدەم شین و رۆڕۆ بەردەوام بۆی بگرین.

خالید نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و ئەم هەواڵەی پێدا. عەبدولمەلیك بۆی نوسی: ئەو کارەم ناسیەوە و لەنێردراوەکەی تۆ سەبارەت بەموهەلیب پرسیارم کرد وئەو ئاگاداری کردمەوە کە ئەوکارگوزاری ئەهوازە. خوا بیرۆکەکەت قێزەون بکات کەبیابان نشینێکی خەڵکی مەککەت بۆ کارێکی گەورە دەست نیشان کرد وپاڵەوانێکی وەك موهەلیب بۆ کۆکردنەوەی باج رادەسپێریت. ئەو رەگ وریشەی پیرۆزی هەیە، سرشتێکی پاك وپێشینەیەك بۆ شەڕ کردن. مناڵی ئەو و مناڵی مناڵی ئەوە (شەڕکەری شەڕکەر زادە). موهەلیب بۆ روبەروبونەوەی ئەوان رەوانە بکە. کەسم بۆ لای بشر لەکوفە رەوانە کرد تا هێزی پشتیوان بۆ تۆ رەوانە بکات. لەگەڵ ئەوان بەرێکەوە، بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمن مەبەستی هیچ کارێك مەکە تا موهەلیب بکات و فەرمانی پێویست لەوبارەوە دەربکات. ماڵئاوا.

عەبدولەلیك بۆ براكەی بشر لەكوفە نامەی نوسی تاپێنج هەزار شەڕكەری بەئەزمون بەفەرماندەیی كەسێك كەدەیناسێت و پەسەندی دەكات، بۆ شەڕی خەواریج ڕەوانە بكات. كاتێك لەم كارە تەواو بون، بڕۆنە ڕەی و لەگەڵ دوژمنەكەیان لەوێ شەڕ بكەن. بشر پێنج هەزار شەڕكەری بەفەرماندەیی عەبدولرەحمان كوڕی محەممەد كوڕی ئەشعەس ڕەوانە كرد و فەرمانێك سەبارەت بەرەی بۆ نوسی كەكاتێك كۆتایی بەجەنگ هێنا، وەك فەرماندار بڕواتە ئەو شارە.

خالید لەگەڵ خەڵكانی بەسرە بەرێكەوت و گەیشتە ئەهواز. عەبدولرەحمان كوڕی محەممەد لەگەڵ خەڵكانی كوفە هات. ئەزرەقیەكان هاتن و لەئەهواز نزیك بونەوە. موهەلیب بەخالیدی وت: من لێرە كەشتی زۆر دەبینم. ئەوان بێنەرە ژێر فەرمانی خۆت چونكە بەزویی دەیانسوتێنن. ئەوەندەی نەخایاند كەشتیەكانیان سوتاند.

خالید، موهەلیبی كردە فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاكەی خۆی و داوود كوڕی قەحزەم لەبەنی قەیس كوڕی سەعلەبەی كردە فەرماندەی باڵی چەپ. موهەلیب لای عەبدولرەحمان كوڕی محەممەد تێپەڕی و بینی خەندەكی بۆ خۆی هەڵنەكەندوە. وتی: بۆ خەندەكەت هەڵنەكەندوە؟ وتی: ئەوان لای من لەترێ وشتر سوكترن. وتی: بەچاوی سوك سەیریان مەكە چونكە دڕندەی عەرەبەكانن.

موهەلیب ئەوەندە نەحەوایەوە كە عەبدولرەحمان خەندەكی هەڵكەند. نزیكەی بیست شەو مانەوە و دواتر خالید فەرمانی هێرشی دەكرد. شتێكیان بینی كەبۆ زۆر لەخەڵكان بوە هۆی ترس و تۆقین. سوارەكان لەسەر ئەوان فراوان بون و بەروی ئەواندا پێشڕەویان دەست پێكرد. ئەوان هەڵاتن وەك بڵێی بەسەر ئاگرەوەن، هەڵدەهاتن و توانای خۆڕاگری لەبەرابەر خەڵكیان نەدەبینی. خالید، داوود كوڕی قەحزەمی بەدوای ئەواندا ڕەوانە كرد. خالید ڕویكردە بەسرە، عەبدولرەحمان ڕۆشتە ڕەی، موهەلیب لەئەهواز مایەوە و ئەم هەواڵەی بۆ عەبدولەلیك نوسی.

كاتێك نامەكەی بە عەبدولەلیك گەیشت، بۆ براكەی بشر كوڕی مەروان نامەی نوسی و فەرمانی پێدا چوار هەزار سوار لەخەڵكانی كوفە، لەگەڵ پیاوێكی شارەزایی شەڕ، بەدوای ئەزرەقیەكان بۆ پارس ڕەوانە بكات. فەرمان بەفەرماندەكە بدات ئەگەر داوود كوڕی قەحزەم ببینێت، لەگەڵ ئەودا هاوئاهەنگ بێت. بشر، عەتاب كوڕی وەرقای هاوڕێ

لەگەڵ چوارهەزار کەس لەخەڵکانی کوفە بۆ پارس رەوانە کرد و ئەوان بەرێکەوتن تا گەیشتنە داوود. کۆبونەوە و دواتر شوێن خەواریج کەوتن تا هەمو ئەسپەکانیان لەناوچون و رەنج و برسیەتی رۆژگاری رەش کردن. زۆرینەی هەردوسوپاکە (لەپیادەکانی ئەهواز) گەڕانەوە.

## بزوتنەوەی ئەبو فودەیك

لەم ساڵەدا بزوتنەوەی ئەبو فودەیك لەخەواریج دەستی پێکرد. ئەو لەبەنی قەیس کوڕی سەعلەبە بو. دەستی بەسەر بەحرەیندا گرت و نەجدە کوڕی عامری حەنەفی کشت. دو بەڵا بەیەکجار بەسەر خالید کوڕی عەبداللەدا هات: دابەزینی قەتەری لەئەهواز و بزوتنەوەی ئەبو فودەیك. ئەوبراکەی ئومەییە کوڕی عەبداللەی بەسوپایەکی گەورە بۆ شەڕ لەگەڵ ئەبو فودەیك رەوانە کرد. ئەبو فودەیك ئەوی تێکشکاند و کەنیزێکی دەستکەوت کە هەڵیگرت. خالید هەواڵی ئەم کارەی بە عەبدولمەلیك راگەیاند.

## کوژرانی عەبداللە کوڕی خازم

کاتێك مەصعەب کوژرا، کوڕی خازم سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ بەحیر کوڕی وەرقای سورەیمی تەمیمی بو لەنەیشابور. عەبدولمەلیك نامەی بۆ کوڕی خازم نوسی و پێشنیاری بەیعەتی پێکرد و تەماحکاری کرد کەخوراسان بەو دەسپێرێت. بەڵێنیدا بۆ ماوەی حەوت ساڵ بیکاتە فەرمانڕەوای خوراسان. نامەکەی بە سوادە کوڕی ئەشتەمی ئەویری یا موکەمیلی غەنەوی رەوانە کرد. کوڕی خازم وتی: ئەگەر ترسی ئەوەم نەدەبو کە لەنێوان بەنی سەلیم و بەنی عامر شەڕ دروست دەبێت، تۆم دەکوشت. بەڵام نامەکەی بخۆ. ئەو نامەکەی خوارد.

دەستەیەك دەڵێن: نامەکەی بەسوادە کوڕی عەبداللە ئەمیری یا موکەمیلی غەنەوی رەوانە کرد. کوڕی خازم پێی وت: باوکی زەبان لەبەر ئەوە تۆی رەوانە کرد چونکە لەخەڵکانی غەنیت وئەو دەزانێت من هیچ کەسێك لەقەیس ناکوژم. بەڵام نامەکەی بخۆ. عەبدولمەلیك بۆ بوکەیر کوڕی وەساج نامەی نوسی. ئەو جێگری کوڕی خازم بو لەمەرو. مژدەی پێدا و هیواداری کرد. بوکەیر لەکوڕی خازم یاخی بو و بەیعەتی لەگەڵ عەبدولمەلیك کرد. خەڵکانی مەرو رازی بون. هەواڵی ئەم کارە بە کوڕی خازم گەیشت و

ترسا بوکەیر بەمەبەستی شەڕی ڕەوانە ببێت و خەڵکانی نەیشابور و مەرو هێرش بکەنەسەری. بوحەیری پشت گوێ خست و ڕوی کردە مەرو و کوڕەکەی لەتەرموز بو. بوحەیر شوێنی کەوت و لەهەشت فەرسەخی مەرو پێیگەیشت. کوڕی خازم لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری کرد. کوڕی خازم کوژرا. ئەو کەسەی کوشتی، وەکیع کوڕی عەمرۆ قورەیعی بو. وەکیع ئەوی خستە سەر زەوی و بوحەیر کوڕی وەرقا و عەمار کوڕی عەبدولعەزیز هێرشیان کردەسەر و هەر سێکیان بەڕم لێیاندا و بەزەویەوە دوریان. وەکیع لەسەر سینەی دانیشت و سەری بڕی. یەکێك لەفەرمانڕەواکان بەوەکیعی وت: چۆن توانیت ئەو بکوژیت. وتی: بەڕم توانیم لەپێی بخەم، کاتێك کەوت، چومە سەرسکی و ئەو نەیتوانی هەستێت. وتم: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی دویلە دەکەن! دویلە برای وەکیع بو لەدایکەوە کە لەیەکێك لەشەڕەکان بەدەستی کوڕی خازم کوژرا. وەکیع دەڵێت: تفی کردە روخسارم و وتی: خوا نفرینت بکات. گەورەی موزەریەکان لەبەرابەر براکەت دەکوژیت؟ ئەو بەهای مشتێك خورمای نیە. وەکیع وتی: لەو کاتەدا نەمدیوە دەمی کەس ئەوەندە تفی تیا بێت.

کاتێك کوڕی خازم کوژرا، بوحەیر نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و ئەوی لەکوژرانی کوڕی خازم ئاگادار کردەوە. سەری ئەوی ڕەوانە نەکرد، بوحەیر، بوکەیر کوڕی وەساجی لەکاتی کوژرانی عەبداللە کوڕی خازم لەگەڵ خەڵکانی مەرو ڕەوانە کرد.، ئەوان کاتێك گەیشتن کەعەبداللە کوڕی خازم کوژرابو. ویستی سەرە براوەکەی هەڵگرێت و بۆ عەبدولەلیکی بنێرێت. بوکەیر گورزێکی لەسەریدا و ئەوی خستە زیندان و سەرە براوەکەی بۆ عەبدولەلیك ڕەوانە کرد و نوسی کەخۆم کوڕی خازمم کوشت. کاتێك سەرە براوەکە گەیشت، عەبدولەلیك نێردراوکەی بوحەیری بانگ کرد و پرسی: ئەمە چیە؟ وتی: نازانم، لێی جیانەبومەوە تا ئەو کاتەی کوڕی خازم کوژرا.

دەستەیەك دەڵێن: کوڕی خازم دوای کوژرانی کوڕی زوبەیر کوژرا. عەبدولەلیك سەرەکەی بۆ کوڕی خازم ڕەوانە کرد و پێشنیاری فەرمان بردنی پێکرد. ئەو سەرە براوەکەی شۆرد و لەپارەچەیەکی ئالآند و ڕەوانەی مەدینەی کرد وپەیکەکەی ناچار بەخواردنی نامەکە کرد و وتی: ئەگەر نێردراو نەدەبویت، دەمکوشتی. دەستەیەك دەڵێن: دو دەست و قاچی ئەوی بڕی و کوشتی و سوێندی خوارد هیچ کات ملکەچی

فەرمانەکانی عەبدولمەلیك نەبێت.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

فەرمانڕەواکان لەم ساڵەدا ئەم کەسانە بون: لەمەدینە تارق بۆ عەبدولمەلیك، لەکوفە بشر کوڕی مەروان، سەرپەرستی دامەزراوەی دادی کوفە عوبەیداللە کوڕی عەبداللە کوڕی عوتبە، لەبەسرە خالید کوڕی عەبداللە ، سەرەپەرستی دامەزراوەی داد هشام کوڕی هوبەیرە، لەخوراسان بوکەیر کوڕی وشاج یا عەبداللە کوڕی خازم.

لەم ساڵەدا عەبیدەی سەلمانی لەهاوەڵانی عەلی کۆچی دوایی کرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی حەفتا و سێی کۆچی (٦٩٢ زایینی)

## کوژرانی عەبدالله کوڕی زوبەیر

کاتێك لەشام لەگەڵ عەبدولمەلیك بەیعەیتان کرد، عوروە کوڕی ئونیفی لەگەڵ شەش هەزار پیاوی شەڕکەر لەخەڵکانی شام رەوانە کرد و فەرمانی پێدا ئەڕواتە ناو مەدینە و لە(عرصە) ئوردو لێ بدات. کارگوزاری کوڕی زوبەیر لەمەدینە، حارس کوڕی حاتب کوڕی حارس کوڕی مەعمەری جومەحی بو. حارس هەڵات. کوڕی ئونیف دەڕۆشتە ناو شار و نوێژی هەینی لەگەڵ خەڵك دەخوێند و بۆ ناو سوپاکەی دەگەڕایەوە. یەك مانگ مایەوە و لەو ماوەدا کوڕی زوبەیر کەسی بۆ شەڕی ئەوان رەوانە نەکرد.

عەبدولمەلیك بۆی نوسی بگەڕێتەوە. ئەو سوپاکەی گەڕانەوە. ئەو کەسەی دوای ئەو پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، عەبدولرەحمان کوڕی سەعیدی قورەزی بو. دواتر حارس بۆ مەدینە گەڕایەوە. کوڕی زوبەیر ئەم جارە سلێمان کوڕی خالیدی زورقی ئەنساری کەپیاوێکی خۆپارێز و داوێن پاك بو، وەك فەرمانداری فەدەك رەوانە کرد. ئەو ڕۆشتە سەر کارەکەی خۆی. عەبدولمەلیك ، عەبدولواحید کوڕی حارس کوڕی حەکەم یا عەبدولمەلیك کوڕی حارس کوڕی حەکەمی رەوانە کرد. ناوی یەکەم راسترە. ئەو لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بەرێکەوت ولەوادی ئەلقورا دابەزی و پێنسەد پیاوی شەڕکەری بەسەرکردایەتی ئەبولقەمقام بۆ شەڕی سلێمان رەوانە کرد کەبینیان هەڵاتوە بەڵام ئەوان دۆزیانەوە و کوشتیان و هاورێکانیان لەناو برد. عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەم کارە خەمبار بو و وتی: پیاوێکی موسوڵمان و پیرۆزتان بێ گوناح کوشت.

کوڕی زوبەیر حارسی لەسەر کار لابرد ولەجیاتی ئەو جابر کوڕی ئەسوەد کوڕی عەوفی زوهری رەوانە کرد. جابر ئەبوبەکر کوڕی ئەبی قەیسی لەگەڵ شەشسەد و چل سوار بۆ فەدەك رەوانە کرد. بینیان کە ئەبولقەمقام لەفەدەك ماوەتەوە و سەرقاڵی سەرکوت و تاڵان کردنی خەڵکە. شەڕیان لەگەڵ کردن. سوپاکەی ئەبولقەمقام شکستی خوارد و سی پیاو لەوان ئەسیر کران و بەئەشکەنجە کوژران. دەستەیەك دەڵێن: هەر پێنسەد پیاوە کوشتار کران.

دوبارە عەبدولمەلیك، تارق کوڕی عەمرۆ کۆیلەی عوسمانی رەوانە کرد و فەرمانی پێدا

لەنێوان ئەیلە و وادی ئەلقورا دابەزێت ورێگەی هاتوچۆ لەکارگوزارانی کوڕی زوبەیر بگرێت و ئەگەر چەوتی لەکارەکانیدا ببینێت، راستیان بکاتەوە. تارق سوپایەکی کردە سەر ئەبوبەکر کەشەڕی لەگەڵ کرد. ئەبوبەکر لەگۆڕەپانی شەڕ کوژرا و لەگەڵ خۆی زیاتر لەدوسەد کەسیتر کوشتار کران.

پێشتر کوڕی زوبەیر بۆ قوباعی( لەکاتی فەرمانداری بەنوێنەرایەتی ئەو لەبەسرە) نوسیبو تا دو هەزار شەڕکەر رەوانە بکات تا پشتیوانی لەفەرماندارەکەی ئەو لەمەدینە بکەن. ئەو دو هەزار پیاوی شەڕکەری رەوانە کرد. کاتێك ئەبوبەکر کوژرا، کوڕی زوبەیر فەرمانی بەجابر کوڕی ئەسوەددا سوپاکەی بەسرە بۆ شەڕی تارق رەوانە بکات. خەڵکانی بەسرە لەمەدینەوە بەرێکەوتن. ئەم هەواڵە بەتارق گەیشت و ئەو روبەرویان بویەوە. دوسوپا شەڕیان کرد. پێشەنگەکانی سوپای بەسرە کوژران و سوپاکەی جابر کوشتار کران و تارق دەستەیەکی بۆ شوێنی کەوتنی ئەوان رەوانە کرد کەبریندارەکانیان سەربڕی و ئەسیرەکانیان کوشت.

تارق بۆ وادی ئەلقورا گەڕایەوە. کارگوزاری کوڕی زوبەیر لەمەدینە، جابر کوڕی ئەسوەد بو. کوڕی زوبەیر لەساڵی ٧٠/ ٦٨٩ زایینی جابری لابرد و لەجێگەی ئەو تەڵحە کوڕی عوبەیداللە کوڕی عەوف ناسراو بەناوی (تەڵحەی بەخشندە) دەست نیشان کرد. ئەو مایەوە تا تارق دەرپەڕاند.

کاتێك عەبدولەلیك مەصعەبی کوشت و رۆشتە کوفە، لەوێوە حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی هاورێ لەگەڵ دو یا سێ هەزار پیاوی شەرکەر لەخەڵکانی شام بۆ شەڕی کوڕی زوبەیر رەوانە کرد. هۆکاری رەوانە کردنی ئەو (لەحیاتی کەسانیتر) ئەوەبو کە دەیوت: من لەخەودا بینیم کە عەبداللەم گرت وپێستیم داماڵی. من رەوانە بکە و کاری جەنگ لەگەڵ ئەو بەمن بسپێرە. ئەوی رەوانە کرد و بەودا ئەمان نامەیەکی بۆ کوڕی زوبەیر و هاورێکانی رەوانە کرد تا ئەگەر فەرمانیان برد، پێیان ببەخشێت. ئەو لە جەمادی الاولی ساڵی ٧٢/ ئۆکتۆبەری ٦٩١ زایینی بەرێکەوت و زیانی بەمەدینە نەگەیاند و لەتاییف نوردوی لێدا. ئەو سوارەکانی بۆ عەرەفە رەوانە دەکرد و کوڕی زوبەیریش سوارکارە بەئەزمونەکانی رەوانە دەکرد. سوارەکانی کوڕی زوبەیر لەهەمو شەڕەکان شکستیان خوارد. بەشێوەیەك سەرکەوتن بو بەشی سوارەکانی حەجاج.

دواتر حەجاج نامەیەکی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و داوای لێکرد تا گەمارۆ بخاتە سەر کوڕی زوبەیر و بڕواتە ناو بارەگایی خوایی. عەبدولمەلیك ئاگاداری کردەوە کەرۆژگاری کوڕی زوبەیر بەرەو سستی و لاوازی دەڕوات و هاورێکانی لەدەروی ئەو بلاوەیان لێکردوە. حەجاج داوای هێزی پشتیوانی لەعەبدولمەلیك کرد. عەبدولمەلیك نامەی بۆ تارق نوسی و فەرمانی پێدا پەیوەستی حەجاج بێت. ئەو لە زیقەعدەی ساڵی ٧٢/ ئاوریلی ٦٩٢ گەیشتە مەدینە و کارگوزاری کوڕی زوبەیری لەوێ دەرپەڕاند و پیاوێك لەخەڵکانی شام بەناوی سەعلەبەی کردە فەرمانڕەوای ئەم شارە. ئەم سەعلەبەیە بەسەر تەختی وتاردانی پێغەمبەر سەردەکەوت و خواردنی دەردەهێناو دەیخوارد و دواتر خورمای دەخوارد تا ئازاری خەڵکانی مەدینە بدات و ریسوایان بکات. ئەو لەبەرابەر کوڕی زوبەیر زۆر سەختگیر بو. تارق لەکۆتایی زەیحەجەی ساڵی ٧٣/ ١١ مەی ٦٩٢ زایینی هاورێ لەگەڵ پێنج هەزار شەڕکەر گەیشتە مەککە.

بەلام حەجاج، لە زیقەعدە، مارسی ٦٩٣ زایینی گەیشتە مەککە. مەبەستی حەج کردنی کرد و جل وبەرگی تایبەت بەحەجی لەبەر کرد  ولەبێر مەیمون دابەزی. لەو ساڵەدا حەجاج لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد بەلام نەبەدەوری ماڵی خوادا سوڕایەوە نەلەنێوا سەفا و مەروە رایکرد. کوڕی زوبەیر رێگەی ئەم کارەی لێگرت. ئەو جلی شەڕی دەپۆشی و تێکەڵ بەژنان نەدەبو و بۆنی خۆشی لەخۆی نەدەدا تا کوڕی زوبەیر لەناوچو. کوڕی زوبەیر و هاورێکانی حەجیان نەکرد چونکە لەعەرەفە نەمانەوە و شەیتانیان بەردباران نەکرد. کوڕی زوبەیر قوربانیەکانی خۆی لەمەککە سەربڕی.

کاتێك حەجاج، لەمەککە گەمارۆی خستە سەر کوڕی زوبەیر، کەشکەنجیرەکانی لەسەر کێوی ئەبو قەیس جێگرکرد و بەرد و ئاگری بەسەر کەعبەدا باراند. عەبدولمەلیك لەرۆژگاری یەزید کوڕی معاویە بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەی کرد و ئێستا خۆی فەرمانیدەدا و ئەو کارەیان دوبارە دەکردەوە. خەڵکان دەیانوت: لەدینەکەی ریسوا بو.

عەبداللە کوڕی عومەر لەو ساڵەدا حەجی کرد. ئەو پەیامی بۆ حەجاج ناردکە: لەخوا بترسە چونکە لەشارێکی پیرۆز و مانگێکی رێز لێگیراودایت. میوانەکانی خوا لەهەر سوچ و قوژبنێکەوە هاتون تا ئایینە خواییەکان جێبەجێ بکەن وپاداشتی زیاتر بەدەست بێنن. بەردهاوێژەکان رێگەیان نادات بەدەوری ماڵی خوادا بسورێنەوە. بەردباران راگرە

تا خەڵك ئەركە دینیەكانیان ئەنجام بدەن. بەردباران راگیرا تا خەڵك لەعەرەفات گەڕانەوە وبەدەوری كەعبەدا سوڕان و لەنێوان سەفا و مەروە رایان كرد. كوڕی زوبەیر رێگەی لەسوڕان و راگردنی خەڵكان نەگرت. كاتێك لە (سوڕانی دیدار) تەواو بون، جارچیەكەی حەجاج جاڕیدا؛ بۆ شارەكانی خۆتان بگەڕێنەوە چونكە دەمانەوێت كوڕی زوبەیر بەردباران بكەین.

یەكەم بەرد كەبۆ كەعبە هاوێژرا، لەئاسماندا خرۆشا و زەوی كوتا و هەورە بروسكەیەكی لێكەوتەوە. خەڵكانی شام بەكارێكی مەترسیداریان زانی و ئەو كارەیان دوبارە نەكردوە. حەجاج خۆی هات و بەردی دەخستە ناو كەشنكەجیرەكان و بۆ كەعبەی دەهاویشت. كاتێك بەرەبەیانی گەیشت، هەورەبروسكە دوانزە كەس لەیارانی ئەوی كوشت. حەجاج وتی؛ ئەی خەڵكانی شام، ئەمە نەبێتە هۆی سەرسوڕمانتان، من كوڕی سەرزەمینی تەهامەم و ئەمە هەورەبروسكەكانی ئەوێیە، مژدەتان لێ بێت چونكە سەركەوتن نزیك بۆتەوە و كاتێك بەیانی هات، هەورەبروسكە دەستەیەك لەیارانی كوڕی زوبەیری لەناو برد. حەجاج وتی؛ ئێوە فەرمانبەری جێگری خوان و ئەمانە خەڵكانێكی نافەرمانن، نابینن چ بەڵایەكیان بەسەردێت؟ كوڕی زوبەیر بەرادەیەك بوێر و چاونەترس بو كە لەژێر بەردباران بۆ نوێژ دەوەستا و بەردەكان لەدەوروبەری دەكەوتنە سەر زەوی و ئەو نەدەترسا و رانەدەچڵكی. خەڵكانی شام دەیانوت؛

یا ابن الزبیر طال ما عصیكا　　　و طال ما عنیتنا الیكا

لتجزین بالذی اتیكا

یانی؛ ئەی كوڕی زوبەیر، رۆژگارێكی درێژە نافەرمانی دەكەیت، رۆژگارێكی درێژە ئێمەت گیرۆدەی رەنج كردوە، بەم بەردانەی بەسەرتۆدا دەبارێن، سزا دەدرێیت.

لەم كاتەدا دەستەیەك لەبیابان نشینەكان هاتن و وتیان: بۆ هاوكاری تۆ هاتوین. شمشێریان لەكالان دەركێشابو كەهاوشێوەی كێردێكی بچوك بو. كوڕی زوبەیر وتی؛ ئەی دەستەی بیابان نشین، كەرەستەكانی شەڕی ئێوە باریكە و وتارەكەتان نامۆ و تاریك. شەڕكەران لەسەوزی بەهار و دوژمنان لەكاتی كەمی گەلارێزان. ئەوان بڵاوەیان لێكرد. شەڕ بەردەوام بو. لەم كاتەدا نرخەكان لای كوڕی زوبەیر بەرز بونەوە و خەڵك گیرۆدەی قاتوقڕی و برسیەتی بون. ئەو ئەسپەكەی خۆی سەربڕی و گۆشتەكەی لەناو هاورێكانی

دابەش کرد. جوجکێك بەدە دەرم دەکڕا و دەفرۆشرا و پیاڵەیەك گەنمەشامی بەبیست درەم. ماڵەکانی کوڕی زوبەیر لێوانلێو بو لەگەنم و جۆ و گەنمەشامی. شامیەکان چاوەڕوانی ڕۆژێك بون پاشەکەوتەکانی ئەو کۆتایی بێت بەلام بەباشی دەستی بەپاشەکەوتەکانی خۆیەوە دەگرت و بۆ ڕۆژە دژوارترەکان هەڵیدەگرت. ئەوەندەی بەخەڵك دەدا تا بەزیندوی بیانهێڵێتەوە، دەیوت: تا ئەو کاتەی ئەم پاشەکەوتانە هەیە، گیان و دڵی هاوڕێکانم بەهێزە.

کاتێك، کاتی کوژرانی ئەو نزیك بویەوە، خەڵك لەدەوری بلاوەیان لێکرد و ڕویان کردە حەجاج و داوای ئەمانیان کرد. نزیکەی دەهەزار کەس لەدەوری ئەو بلاوبونەوە کەدو کوڕەکەی خۆی خوبەیب و حەمزە لەناویاندا بون. ئەم دوانە ئەمانیان بۆ خۆیان وەرگرت. عەبدالله بەسێیەم کوڕی وت: وەك براکانت برۆ و ئەمان بۆ خۆت وەربگرە چونکە حەز دەکەم ئێوە زیندو بمێنن. کوڕ وتی: گیانی خۆم بەلەپێشتر لەگیانی تۆ نازانم.

کاتێك یارانی کوڕی زوبەیر بلاوەیان لێکرد، حەجاج بۆ خەڵك قسەی کرد و وتی: دەبینن چ دەستەیەکی کەم لەگەڵ کوڕی زوبەیرن و چۆن لەبەدبەختی و تەنگانەدا ژیان بەسەر دەبەن. ئەوان شادمان بون و پێشڕەویان دەستپێکرد و نێوان حەجون و ئەبوا یان پڕکرد. ڕۆشتە لای دایکی و وتی: ئەی دایکە، دەبینی کە هاوڕێکانم بەجێیان هێشتوم و تەنانەت کەسانی بنەماڵەکەم و کوڕەکانم لەدەورم بلاوبونەتەوە وجگە لەدەستەیەکی کەم کەس لەگەڵ من نەماوە و زیاتر لەکاتژمێرێك ناتوانم خۆڕاگری بکەم. ئەم خەڵکە ئەوەی لەم دنیام دەویست، بەمن پێشنیاری دەکەن. بۆچونی تۆچیە؟ دایکی وتی: تۆ خۆت ئاگادارتریت. ئەگەر دەزانی لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروستیت و بانگەوازی ئەوە دەکەیت، درێژە بەرێگەکەت بدە کەیارانت لەسەر ئەم ڕێگەیە کوژران. کوڕانی بەرەلای ئومەییە سوار ملی خۆت مەکە کە گەمە بەچارەنوسی تۆ بکەن. ئەگەر بۆ دنیا شۆڕشت کرد، بەندەیەکی خراپیت کە خۆت و هاوڕێکانت لەناو برد. ئەگەر دەڵێی: لەسەر ڕاستی و دروستی بوم و چونکە هاوڕێکانم هاوکاریان نەکردم، لاواز بوم، ئەمە شێوەی ئازادەکان و دیندارەکان نیە. کێ لەم جیهانەدا ماوەتەوە تا یەکێك بیت لەوان؟ کوژران باشترە لەم ژیانە! وتی: دایکە، دەترسم ئەگەر بکوژرێم، جەستەم لەت لەت بکەن و لەدارم بدەن.

دایك وتی: کورم، کاتێك مەڕ دەکوژن، ئازار ناچێژێت کاتێك پێستەکەی دادەماڵن. لەسەر بنەمای راستی و دروستی بۆ پێشەوە بڕۆ و داوای هاوکاری لەخوا بکە.
کوڕی زوبەیر سەری دایکی ماچ کرد و وتی: بۆچونی خۆیشم ئەومیە. سوێند بەو کەسەی تا ئەمڕۆ لەرێگەی ئەودا هەوڵمداوە، هەرگیز خوازیاری ئەم ژیانە نەبوم و ژیانم خۆش نەویستوە. ئەوەی بۆ ئەم کارە پالی پێوەنام، جگە تورەیی لەرێگەی خوادا نەبو چونکە دەمبینی پەردەی بارەگای خوایی دەدرێت و فەرمانەکانی پێشێل دەکرێن. بەلام ویستم بۆچونی تۆ بزانم. تۆزیاتر منت وشیار کرد. دایکە، سەیرکە و بزانە، ئەمڕۆ من دەکوژرێم، کەواتە باخەم لەسەر شانی تۆ قورسایی نەکات. کاری خۆت بەخوا بسپێرە چونکە کورەکەت نەیویست وشیارانە گوناحێك ئەنجام بدات یا کارە قێزەونەکان بکات. لەفەرمانی خوا ستەمی نەکرد و ئەمانەکانی پێشێل نەکرد و ناگایانە ستەمی لەموسولمانێك نەکرد. لەفەرماندارەکانم هەوالی ستەمکاری بەمن نەگەیشت کە پێی رازی ببم یا شادمان بەلکو بەزمان و دەست سەرکۆنەم کرد. بەبڕوای من هیچ کارێك باشتر لەرەزامەندی خوا نەبو. ئەی خوایە، ئەمە بۆ پاك کردنەوەی خۆم نالێم، بەلام بۆ دڵدانەوەی دایکم دەیهێنمە سەر زمان.
دایکی وتی: هیوادارم بەباشترین شێوە پرسەت بۆ بگێڕم. ئەگەر پێش من بۆ ئەو دنیا بڕۆیت، کوژرانی تۆ بەخوا دەسپێرم و ئەگەر سەرکەوتیت، شادمان دەبم. بڕۆ، تا بزانم ئەنجامی کارەکەت بەکوێ دەگات. کوڕی زوبەیر وتی: ئەی دایکە، خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، پاڕانەوە لەخوا بۆ من لەبیر مەکە. دایکی وتی: هیچ کات لەبیری ناکەم. ئەگەر کەسانیتر لەسەر رێگەی چەوتی و لاری کوژران، تۆ لەسەر رێگەی راست و دروست کوژراییت. دواتر ئەو ژنە وتی: خوایە بۆ شەو بەئاگامانەوەکانی ئەو و پاڕانەوەکانی لەدەرگای تۆ لەشەوە درێژەکان، بۆ رۆژوەکانی لەرۆژە گەرمەکانی مەککە و مەدینە وچاکەکاری لەجێگەی باوك و لەبەر من، بیبەخشە. خوایە ئەو تەسلیمی فەرمانەکانی تۆ دەکەم و بەهەر چارەنوسێك فەرمان بدەیت، رازیم، پاداشتی خۆڕاگرانیش بەمن ببەخشە.
ئەو دەستی دایکی گرت و ماچی کرد. ژن وتی: ئەمە ماڵئاواییە، هەرگیز دور نەبیت. ئەو بەدایکی وت: بۆ ماڵئاوایی هاتوم چونکە ئەمە دوایین رۆژی ژیانی منە لەم جیهانە. ژن

وتی: لەسەر بنەمای زانایيت بۆ پێشەوە وەرە و لێم نزيك بە تا ماڵئاواييت لێ بكەم. كوڕ لێی نزيك كەوتەوە. دايك لەئامێزی گرت و ماچی كرد. دەستی بەرزرێكەی كەوت. وتی: زرێ پۆشين كاری كەسێكی وەك تۆ نيە كە مەبەستێكی گەورەی هەبێت. وتی: زرێم نەپۆشی تەنيا لەبەر ئەوەی دڵی تۆ بەهێز بكەم. دايك وتی: من وەرم بەرزە. كوڕی زوبەير زرێكەی دەرهێنا و قۆڵەكانی هەڵكرد و داوێنی عاباكەی خستە ناو شەرواڵەكەی و خوارەوەی خستە ژێر پشتێنەكەی خۆی و دايك بەردەوام دەيوت: داوێنی جلەكانت، بەبەهێزی رابگرە. هاتەدەر و وتی:

انی اذا اعرف یومی اصبر          و انما یعرف یومه الحر

اذ بعضهم یعرف ثم ینكر

يانی: كاتێك رۆژی مەرگ بناسم، خۆراگری دەكەمە پيشە چونكە پياوی ئازاد رۆژی مردنەكەی خۆی باش دەزانێت بەڵام دەستەيەك دەيزانن و خۆيان بەنەزان نيشان دەدەن.

دايكی دەنگی ئەوی بيست و وتی: بەخواستی خوا خۆڕاگری بكەرە پيشە. باوكانی تۆ ئەبوبەكر و زوبەيرن و دايكت صەفيە كچی عەبدولموتەليبە. ئەو هێرشێكی قورسی كردە سەر خەڵكانی شام و كەسانێك لەوانی كوشتار كرد. دواتر خۆی و هاورێكانی پاشەكشێيان كرد ولەيەك بچڕان. يەكێك لەيارانی پێی وت: باشترە بەرەو فلاّن شوێن برۆيت. كوڕی زوبەير وتی: ئەوسا دەبمە پيرێكی خراپ لەئيسلام كە خەڵكان بەكوشتن دەدەم و لەكاتی گرفتار بون، خۆم رادەكەم. خەڵكانی شام نزيك كەوتنەوە بەشێوەيەك كە دەرگا و ماڵ و كۆلاّنەكان لەوان لێوانلێو بو. هاواريان دەكرد: ئەی كوڕی (ذات النطاقين). ئەو دەيوت:

و تلك شكاة ظاهر عنك عارها

يانی: ئەمە سكالاّيەكە كە ئەنگی لەتۆ سڕيوەتەوە.

خەڵكانی شام بۆ هەر دەرگايەك لەدرگاكانی مزگەوت دەستەيەك لەخەڵكی شارەكانيان دەست نيشان كرد: دەرگای روبەروی كەعبەيان بۆ خەڵكانی حيمص دانا، بۆ خەڵكانی ديمەشق لەبەنی شيبە، بۆ خەڵكانی ئەردەن لەصەفا، بۆ فەلەستينيەكان لەبەنی جومەح و ۆ خەڵكی قێنرسين لەبەنی تەميم. حەجاج و تارق لەدەروازەی ئەبتەح تا مەروايان

لەژێر دەستا بو. کوڕی زوبەیر هەندێ کات هێرشی دەکردە سەر ئەملا و هەندێ کات هێرشی دەکردە سەر ئەولا. هاوشێوەی شێری دارستان بو. خەڵکان هێرشیان نەدەکردە سەر ئەو مەگەر ئەو کاتەی ئەم هێرشی دەکرد و دەریدەپەڕاندن. دواتر هاواری دەکرد: ئەی باوکی سەفوان! هاوار چ سەرکەوتنێکی گەورە، ئەگەر پیاوانێك هاوڕێم دەبون، خۆزگە دوژمنەکەی من یەك کەس دەبو، دەمتوانی شکستی بدەم. باوکی سەفوان عەبدالله کوڕی سەفوان کوڕی خەلەف دەیوت: بەڵێ بەخوا، هەزار جار.

کاتێك حەجاج بینی خەڵك هێرش ناکەنە سەر کوڕی زوبەیر، تورە بو و دابەزی و خەڵکی بۆ پێشڕەوی ناچار کرد و خۆڕاگری کرد تا ئەوەی ئاڵادارەکەی کوڕی زوبەیر لەبەرابەر ئەو بەرگری کرد. کوڕی زوبەیر پێش ئاڵادارەکەی خۆی دەکەوت و هێرشی دەبرد و دواتر دەگەڕایەوە و لەشوێنی (مقام) دو رکەعەت نوێژی دەخوێند. ئەوان هێرشیان کردە سەر ئاڵادارەکەی و کوشتیان و لەسەر دەروازەی بەنی شیبە خستیانە سەر زەوی. ئاڵا کەوتە دەست هاوەڵانی حەجاج. کاتێك لەنوێژ تەواو بو، هێرشی برد و بێ ئاڵادار شەڕی کرد. لەپیاوێك لەخەڵکانی شامیدا و خستیە سەرزەوی و وتی: بیگرە من کوڕی حەواریم. لەپیاوێکی حەبەشیدا و دەستی فڕتاند و وتی: خۆڕاگر بە ئەبو حومحومە، خۆڕاگربە کوڕی حام. عەبدالله کوڕی موتیع شان بەشانی ئەو شەڕی دەکرد و دەیوت:

انا الذی فررت یوم الحرة        و الحر لا یفر الا مرة

و الیوم اجزی فرة بکره

یانی: من ئەو کەسەم لەشەڕی حوڕە هەڵاتم، جوامێر کەسێکە زیاتر لەجارێك رانەکات، ئەمڕۆ هەڵمەتێك لەبەرابەر هەڵاتنێك.

ئەو شەڕی کرد تا کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: برینداربو و دوای چەند رۆژ مرد.

کوڕی زوبەیر لەو رۆژەی کەکوژرا، دوای نوێژی بەرەبەیان بەهاوەڵانی خۆی وت: روبەندەکانی خۆتان بکەنەوە تا جوان سەیرتان بکەم. روبەندیان لەسەر و روخساری خۆیان بەستبو. ئەوان روخساری خۆیان ئاشکرا کرد. وتی: ئەی بنەماڵەی زوبەیر، ئەگەر گیان بەخشینتان بۆ من خۆش دەوێت، دەبێت بزانن ئێمە منداڵی بنەماڵەیەك بوین لەرێگەی خوادا هەنگاومان هەڵگرت. داباریني شمشێرەکان ئێوە نەترسێنێت چونکە

دەردی دەرمان بەئازارتر لەدەردی بەرکەوتنی برینە. بەشێوەیەك پارێزگاری لەشمشێرەکانی خۆتان بکەن کەروخساری خۆتان دەپارێزن. چاو لەشمشێرەکان هەڵبگرن، هەر کەس تەنیا ئاگای لەشەرکەری بەرابەری بێت. پرسیار لەمن مەکەن. هەرکەس بەدوای مندا گەڕا، بزانن لەپێش هەموتانەوەم. هەڵمەت بەرن بەناوی خوا! دواتر هێرشی کردە سەر ئەوان و تا حەجون پاشەکشێی پێ کردن. لەم کاتەدا خشتێکیان تێگرت. پیاوێکی سەکونی هەڵیدا کە بەر روخساری کەوت و بریندار و خوێناوی کرد و کوڕی زوبەیر لەرز دایگرت. کاتێك خوێنی بەروخساریەوە بینی، وتی:

فلسنا علة الاعقاب تدمى كلومنا          و لكن على اقدامنا تقطر الدما

یانی: ئێمە کەسانێك نین برین بەر پشتمان بکەوێت و خوێن ببارێت بەڵکو خوێن لەبەر پێماندا دەبارێت.

ئازایانە شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و ئەوان بۆ کوشتنی هاودەنگ بون و ئەویان لەسێ شەممە (لەسێیەمی) جەمادی الثانی

کوشت. لەکاتی کوژران تەمەنی حەفتا و سێ ساڵ بو. پیاوێك لەموراد ئەوی سەربڕی. سەری ئەویان بردە لای حەجاج. ئەو سەری خستە سەرزەوی و سوپاسی خوای کرد. پیاوی سەکونی و موراری وەك نێردروای خۆی بۆ لای عەبدولەلیك رەوانە کرد و پێنسەد دیناری بەهەرکامیان بەخشی.

حەجاج و تارق بەرێکەوتن و لەسەر سەری وەستان. تارق وتی: ژنان پیاوێکی بوێرتریان لەم گەورەزادە نەبوە. حەجاج وتی: دوژمنی سەرومری باوەرداران وەسف دەکەیت؟ وتی: بەڵێ، ئەو بیانو و بەڵگەی زیاتر بۆ ئێمە کۆدەکاتەوە (کارەکانی ئێمە باش وەسف دەکات). حەوت مانگە گەمارۆمان خستۆتەسەر، نەسوپایەکی هەیە، نە قەلایەك نە دیوارێك نە بارەگایەك. لەگەڵ ئێمە بەرابەری دەکات و لەپێش ئێمەوەیە. وتارەکەی بەگوێی عەبدولەلیك گەیشت و ئەو تارقی بەراستگۆ زانی.

کاتێك کوڕی زوبەیر کوژرا، خەڵکانی شام لەشادمانیدا تەکبیریان وت. کوڕی عومەر وتی: سەیری ئەوان بکەن، موسوڵمانان لەکاتی لەدایك بونی ئەو تەکبیریان وت و ئەمان لەکاتی کوژرانی ئەو.

حەجاج سەری ئەو و عەبدالله کوڕی صەفوان و عومارە کوڕی عەمرۆی بۆ لای کوڕی

حەزم لەمەدینە رەوانە کرد. ئەوانیان بردە لای عەبدولمەلیك. لاشەی ئەوی هەڵگرت و لەسەر تەپۆڵکەی راست لەحەجون لەداریدا. دایکی ئەسما پەیامی بۆ نارد، خوا بتکوژێت! بۆ لەدارت داوە؟ حەجاج وەڵامی دایەوە: من و ئەو بەرەو ئەم دارە رامان کرد، ئەو خێراتر رۆیشت و بەدارەکەدا سەرکەوت. داوای فەرمانی لێکرد تا کورەکەی کفن بکات و بەخاکی بسپێرێت. حەجاج رازی نەبو و چەندین پاسەوانی بۆ دانا تا لاشەکەی لەوێ بهێڵنەوە. هەواڵی ئەم کارەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی. عەبدولمەلیك وەڵامی دایەوە و سەرکۆنەی کرد و وتی: بۆ جەستەییت تەسلیمی دایکی نەکردوە؟ حەجاج فەرمانی ئەو کارەی دەرکرد و دایکی ئەوی لەحەجون بەخاك سپارد. عەبدالله کوڕی عومەر لەوێوە تێپەڕی و وتی: سلاو لەتۆ ئەی باوکی خوبەیب! سوێند بەخوا من رێگەی ئەم کارەم لێگرتیت. تۆ پیاوێك بویت نوێژ خوێن و رۆژوگر و بەهێزکەری پەیوەندی خزمایەتی. سوێند بەخوا ئەو خەڵکەی تۆ خراپترین کەسیان بیت، باشترینی خەڵکانن.

کوڕی زوبەیر، پێش کوژران، (صەبر) بۆنی خۆشی بەسەر و روخساری خۆیدا پرژاند تا جەستەی بۆگەن نەکات. کاتێك ئەویان لەداردا، بۆنی خۆش بەهەمو لایەکەدا بڵاوبویەوە. دەستەیەك دەڵێن: حەجاج بۆ نەهێشتنی بۆنەکە فەرمانیدا سەگێکی تۆپیو یا پشیلەیەکیان لەوێ لەداردا.

کاتێك عەبدالله کوڕی زوبەیر کوژرا، براکەی عوروە سوار وشترێکی تیژپێ بو و روی لەدەرباری عەبدولمەلیك کرد و پێش گەیشتنی نێردراوەکەی حەجاج بۆ گەیاندنی هەواڵی کوژرانی کوڕی زوبەیر، گەیشتە شام. رۆشتە بەردەم بارەگای عەبدولمەلیك و داوای مۆڵەتی چونە ژوورەوەی کرد کە پێی درا. رۆشتە ژور و بەناوی سەرەوەری باوەڕداران سلاوی لە عەبدولمەلیك کرد. عەبدولمەلیك بەچاکە وەڵامی دایەوە و بەخێرهاتنی کرد و لەگەڵ خۆی لەسەر تەختەکە داینیشاند. عوروە وتی:

متت بارحام اليك قريبه و لا قرب للارحام ما لم تقرب

یانی: بەپەیوەندی خزمایەتی نزیکەوە پەیوەستی تۆ بوم، پەیوەندیەکان نزیك نین مەگەر ئەوەی کەسەکان لەیەکی نزیك بکەنەوە.

دواتر گفتوگۆیان کرد تا باسی عەبدالله هاتە ئاراوە. عوروە وتی: ئەو (بو). عەبدولمەلیك پرسی: ئەی ئێستا؟ وتی: کوژرا. عەبدولمەلیك کەوتە سەر زەوی و سوپاسی خوای کرد.

عوروه وتی: حەجاج ئەوی کوشت، جەستەکەی بەدایکی ببەخشە. عەبدولمەلیك رازی بو و وتی: ئەو کاره دەکەم. نامەی بۆ حەجاج نوسی و لەداردانی ئەوی بەکارێکی دژوار و گران زانی. لەولا حەجاج بینی کە عوروه لەشوێنەکەی خۆی نیە، نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و وتی: عوروه لەگەڵ براکەی بو، کاتێك عەبدالله کوژرا، بڕێك سامانی هەڵگرت و رایکرد. عەبدولمەلیك وتی: ئەوی راینەکرد بەڵکو فەرمانبردار هاتە لای من و ئەمانم پێ بەخشی و ئەوەی کردویەتی و بردویەتی، بۆ ئەو ڕەوایە. ئێستا دێتە لای تۆ، ئاگاداربە کەمترین ئازار لەعوروه نەدەیت. عوڕوه گەڕایەوە بۆ مەککە. ئەمانی ئەو لەمەککە سی رۆژی خایاند.

حەجاج جەستەی عەبدالله داگرت و بۆ دایکی نارد کە شۆردی. کاتێك ئاو بەجەستەی گەیشت، لەت لەت بو. دایکی هەمو ئەندامەکانی شۆرد و جەستەکەی یەکی گرتەوە. عوروه نوێژی لەسەر خوێند و دایکی بەخاکی سپارد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك عوروه لای عەبدولمەلیك خۆی شاردەوە، حەجاج نامەی بۆنوسی و داوای لێکرد عوروه رەوانە بکاتەوە. عەبدولمەلیك بڕیاری گەڕانەوەی ئەویدا. عوروه وتی: داماو ئەو کەسە نیە کە کوشتتان، ئەو کەسەیە کەوتە بەردەستتان. سەرکۆنە کراو ئەو کەسە نیە کە خۆڕاگری کرد و کوژرا، ئەو کەسەیە پێش مردن هەڵات. عەبدولمەلیك ئەم قسەی بیست و وتی: ئەی باوکی عەبدالله، لەمنێمە وتارێکی ناخۆش نابیستیت.

دەڵێن: کەس لەسەر عەبدالله نوێژی نەخوێند چونکە حەجاج رێگری لەم کاره کرد و وتی: سەرورەری باوەڕداران تەنیا فەرمانی بەخاك سپاردنی ئەوی داوە. دەستەیەك دەڵێن: عوروه نوێژی لەسەر خوێند. ئەوەی موسلیم لەکتێبی (صحیح) ئاماژەی پێداوە، ئەوەیە کە: عەبدالله کوڕی زوبەیریان لەگۆڕستانی جولەکەکان فرێدا. دایکی ماوەیەك دوای ئەو زیندو مایەوە و دواتر کوێربو و مرد. ئەو دایکی عورومیش بو.

کاتێك حەجاج لەکاری کوڕی زوبەیر تەواو بو، ڕۆشتە ناو مەککە. خەڵکەکەی بۆ فەرمان بردن لەعەبدولمەلیك بەیعەتیان لەگەڵ کرد. ئەو فەرمانی شۆردن و پاك کردنەوەی بارەگای خوایی لەدار و بەرد و خوێندا و بەرەو مەدینە بەرێکەوت. عەبدولمەلیك ئەوی وەك فەرمانداری مەککە و مەدینە دەستنیشان کردبو. کاتێك گەیشتە مەدینە، یەك یا

دو مانگ لەوێ مایەوە. خراپ هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵك دەکرد و ریسوایی دەکردن و دەیوت: ئێوە بکوژەکانی سەرومری باوەڕداران عوسمانن. بۆ ریسوا کردن دەستی زۆر لەهاوەلآنی پێغەمبەری بەمس مۆر کرد بەهەمان شێوە کە لەگەڵ ئەمان پێ بەخشراوان (ئەهلی ذمە) دەیکەن. جابر کوڕی عەبدالله و ئەنس کوڕی مالك و سەهل کوڕی سەعد لەناو ئەو کەسانەدا بون. دواتر بۆ مەککە گەڕایەوە. کاتێك لەو شارە هاتەدەر، وتی: سوپاس بۆ خوا کە منی لەشارێکی گەنیو و بۆگەن هێنایەدەر. خەڵکەکەی خراپترین خەڵکانی سەرزەوین و فریوبازترینی دڵەکان کە لەبەرابەر سەرومری باوەڕداران هەیانە و بۆ ئەو بەخشینانەی خوا بەوەی بەخشیوە، زیاتر لەهەمو خەڵکان رژدی دەبەن. سوێند بەخوا ئەگەر بەردەوام نامەی سەرومری باوەڕداران سەبارەت بەوان نەدەگەیشت (کە چاکەیان لەگەڵ بکەم) ئەم شارەم هاوشێوەی ورگی کەر یا دارە وشکەکان یا نێسقانە رزاوەکان لەناو دەبرد. بەپێ پیسەکانی خۆیان دەرۆنە سەر تەختی وتاردانی پێغەمبەر و گلاَوی دەکەن. وتارەکەی بەگوێی جابر کوڕی عەبدالله گەیشت، وتی: بەدوای ئەم سەرخۆشی و سەرمەستیانە، روداوێك پێشدێت کە لوتی ئەو لەزەوی دەدات. فیرعەونی میسریش ئەم قسانەی دەهێنایە سەرزمان و خوا ماوەیەك دەرفەتی پێدا و دواتر لەناوی برد.

دەستەیەك دەڵێن: فەرمانداری حەجاج لەسەر مەدینە و خراپ هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ خەڵکان و هاوەلآنی پێغەمبەر لەصەفەری ساڵی ٧٤/ ژونەنی ٦٩٣ زایینی بو.

## ژیانی کوڕی زوبەیر و شێوەی کرداری ئەو

کاتێك کوژرا، تەمەنی حەفتا و دو ساڵ بو. خەلافەتی ئەو نۆ ساڵی خایاند چونکە لەساڵی ٦٨٣/٦٤- ٦٨٤ زایینی وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ کرد. ئەو قژی درێژ و پەرێشان بو.

یەحیا کوڕی وەساب دەڵێت: کاتێك کوڕی زوبەیر لەکاتی نوێژ سەری دادەنەواند و ناوچاوی دەخستە سەرزەوی، باڵندەکان دەهاتن و لەسەر پشتی دەنیشتنەوە چونکە پشتی ئەویان بەدیوار دەزانی لەبەر ئەوەی لەکاتی نوێژ زۆر نارام و ئاسودە بو و ناوچاوی بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر زەوی دەمایەوە. کەسانیتر دەڵێن: عەبداللە شەوی بۆ سێ بەش دابەش کردبو: شەوێك تا بەرەبەیان لەسەر پێ رادەوەستا، شەوێك تا بەرەبەیان رکوعی دەبرد وشەوێك تا بەرەبەیان سوجدە. دەستەیەك دەڵێن: یەکەم کار کە لەکوڕی زوبەیر وەشایەوە و بوێری ئەوی نیشاندا، ئەوە بو کە رۆژێك لەگەڵ منالآن گەمەی دەکرد، پیاوێك هات و تێپەڕی و بەسەر ئەواندا قیژاندی کەبلآوەیان لێکرد و رایان کرد. کوڕی زوبەیر رۆشتە دواوە و وتی: من بکەنە سەرکردەی خۆتان، تا هێرش بکەینە سەر ئەم پیاوە. ئەو کارەیان کرد. عومەر کوڕی خەتاب لای ئەو تێپەڕی و ئەو لەگەڵ منالەکان گەمەی دەکرد. منالەکان رایان کرد و ئەو لەشوێنەکەی خۆی مایەوە. عومەر پێی وت: بۆ رات نەکرد؟ وتی: نە گوناحێکم کردوە تا لەتۆ بترسم نەرێگە تەنگ بو تا رێگەت بۆ بکەمەوە.

قەتەن کوڕی عەبداللە دەڵێت: کوڕی زوبەیر هەینی بۆ هەینی بەرۆژو دەبو. خالید کوڕی ئەبی عیمران دەڵێت: کوڕی زوبەیر لەمانگدا تەنیا سێ رۆژ بەرۆژو نەدەبو. چل ساڵ مایەوە و جل و بەرگەکانی دانەنا.

موجاهید دەڵێت: هیچ دەرگایەك لەدەرگاکانی پەرستینی خواوەند نەبو کەلای خەڵك دژوار بێت و کوڕی زوبەیر تەقەی لێنەدا. جارێك لافاوێك هات و کەعبەی پڕ کرد. کوڕی زوبەیر بەمەلە بەدەوری ماڵی خوادا دەسورایەوە. هشام کوڕی عوروە دەڵێت: یەکەم شت کە مامم لەمناڵیدا هەڵیگرت، شمشێر بو. زوبەیر دەیوت: تۆ بەردەوام کارت بەم شمشێرە دەبێت. ئیبن سیرین دەڵێت: عەبداللە کوڕی زوبەیر دەیوت: هیچ هەواڵێك نەبو کەپیاوی پێشگۆ ( کەعب، یا ئەگەری هەیە کەعب الاخبار) بیڵێت و نەیێتە دی،

مەگەر ئەوەی کەوتی: جوامێرێك لەخەڵکی سەقیف تۆ دەکوژێت و ئێستا سەری تۆ لەبەردەم ئەودا (یانی موختار) دەبینم. ئیبن سیرین دەڵێت: کوڕی زوبەیر نەیدەزانی کەرۆژگاری دەستی حەجاجی خراپی بۆ ئەو هەڵگرتبو.

عەبدولعەزیز کوڕی ئەبی جەمیلەی ئەنساری دەڵێت: عەبدالله کوڕی عومەر لای جەستەی هەڵواسراوی کوڕی زوبەیر تێپەڕی و وتی: خوا لێت خۆش بێت ئەی باوکی خوبەیب، تۆ پیاوێکی رۆژوگر و نوێژخوێن بویت لەشەواندا. ئەگەر تۆ خراپترین پیاوی قورەیش بیت، بێ گومان هەمو قورەیشیەکان رزگاربوانن.

حەجاج کوڕی زوبەیری لەداردا و دواتر ئەوی لەگۆڕستانی جولەکەکان فرێدا. کەسی بۆ لای دایکی رەوانە کرد و بانگی کرد. دایکی نەهات. پەیامی بۆ ناردکە: وەرە وەگەرنە کەسانێك رەوانە دەکەم تا بەقژ بتهێنن. دایك نەهات. حەجاج رۆشتە لای و کاتێك گەیشت، پێی وت: بینیت چیم لەگەڵ عەبدالله کرد؟ دایك وتی: بینیم کە ئەم جیهانەت لێ خراپ کرد و ئەو، ئەو جیهانی لەتۆ شێواند. پێغەمبەر پێی وتین: لەناو سەقەفیەکان دوپیاو دەردەکەون، یەکیان زۆر درۆزن و یەکیان ماڵ کاولکەر. موختارم (درۆزن)بینی. کاولکەر تۆیت. ئەم گێرانەوەیەکە موسلیم لە کتێبەکەی خۆی (صحیح) ئاماژەی پێداوە.

عەبدالله کوڕی زوبەیر بەعەبدالله کوڕی جەعفەری وت: بیرتە رۆژێك چاومان بەپێغەمبەری خوا کەوت؟ من و تۆ بوین و ئەو کچەکەی من فاتیمەی هەڵگرت. عەبدالله کوڕی جەعفەر وتی: بەڵێ، بیرمە کەئێمەی هەڵگرت و تۆی پشت گوێ خست. ئەگەر کوڕی زوبەیر دەیزانی ئەم وەڵامە دەبیستێت، ئەو پرسیارەی نەدەکرد.

## فەرمانداری محەممەد کوڕی مەروان لەئەرمەنستان و جەزیرە

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك براکەی خۆی محەممەدی وەك فەرماندار بۆ ئەرمەنستان و جەزیرە رەوانە کرد. ئەو لەوێ شەڕی کرد و بەسەختی دوژمنانی سەرکوت کرد. دەریاچەی تەریخ لەئەرمەنستان ئازاد و کەس دەستی بەسەردا نەگرتبو. هەرکەس هەرچی دەویست، لەو دەریاچەیە هەڵیدەگرت. ئەو ماسی گرتنی لەم دەریایە ناڕەوا کرد و چەندین کەسی دانا تا بیفرۆشن. دوای خۆی بوبە موڵکی کوڕەکەی خۆی یانی مەروان. کاتێك فەرمانڕەوایی لەدەست ئومەوییەکاندا نەما، دەریاکەیان لەدەست دەرهێنان. تا ئێستا بەمشێوەیە پارێزراوە. هەرکەس بناغەی ئایینێکی تازە بەڵام زیانبەخش دابنێت، گوناح و هەرکەس ئەو ئایینە جێبەجێ بکات، تا رۆژی هەستانەوە لەئەستۆی ئەودایە بێ ئەوەی لەقورسایی گوناحی ئەنجامدەرەکان کەم بکاتەوە.

تەریخ لەسەرسورهێنەرەکانی جیهانە. ماسیەکانی وردن. هەر ساڵە و لەکاتێکی دیاریکراودا ماسیەکانی دەڕۆنە ناو روبارێك کەبەدەست و تۆڕ راو دەکرێن و کاتێك ئەو کاتە بەسەر بچێت، هیچ شتێکی تیا نابینرێت.

## کوژرانی ئەبو فەدەیکی خارجی

لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ٧٢/ ٦٩١ زایینی لەکوژرانی نەجدە کوڕی عامر خارجی و لایەنگیری کردنی هاورێیانی ئەو لە ئەبو فەدەیکی خارجی و بەهێزبونی ئەبو فەدەیك، قسەمان کرد. عەبدولمەلیك کوڕی مەروان، فەرمانی بە عومەر کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەعمەردا تا خەڵکانێك لەکوفە و بەسرە بۆ شەڕی ئەو ئامادە بکەن کە دەهەزار پیاوی شەڕکەر خوازیاری ئەم کارە بون. ئەو بەخششەکانی بەواندا و رۆژیەکانی لەناو ئەواندا دابەش کرد و رەوانە بون. خەڵکانی کوفەی لەباڵی راست جێگیر کرد و محەممەد کوڕی موسا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیداڵلەی کردە فەرماندەی ئەوان و خەڵکانی بەسرەی لەلای چەپ و عومەر کوڕی موسا کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەعمەری کردە فەرماندەی ئەوان. ئەو برازای عومەر بو. سوارکارەکانی لەناوەراستی سوپاکەدا جێگیر کرد. بەرێکەوتن تا گەیشتنە شاری بەحرەین. هەردولای شەڕکەر روبەروی یەك بونەوە و بۆ شەر خۆیان ئامادە کرد. ئەبو فەدەیك و هاوەڵانی هاوشێوەی یەك پیاوی تاقانە هێرشیان دەبرد و

باڵی چەپی سوپاکەی عومەر کوڕی عوبەیداللە یان تێکشکاند، جگە لەموغەیرە کوڕی موهەلیب و موجاعە کوڕی عەبدولرەحمان و سوارەکانی سوپاکە کەپوەستی باڵی راست و خەڵکانی کوفە بون. عومەر کوڕی موسا بریندار بو.

کاتێك شەڕکەرانی باڵی چەپ بینیان شەڕکەرانی باڵی راست شکست ناخۆن، گەڕانەوە و پیاوانە شەڕیان کرد بێ ئەوەی فەرماندەیان هەبێت چونکە فەرماندەکەیان عومەر کوڕی موسا بریندار بو. شەڕ روی لەدوژاری کرد و گەیشتنە قولایی سوپاکەی ئەبو فەدەیك و شەڕکەرانی باڵی راست و خەڵکانی کوفە هێرشیان برد و سوپاکەی ئەبوفەدەیکیان تێکشکاند و خۆی کوژرا و لەموشەقەر گەمارۆیان خستە سەر هاورێکانی. خەواریج ملکەچی فەرمانەکانی عومەر کوڕی عوبەیداللە بون. نزیکەی شەش هەزار کەس لەوان کوژرا و هەشتسەد کەسیان بەئەسیری گیرا. کەنیزەکەی عەبداللە کوڕی ئومەییە لەئەبوفەدەیك دوگیان بو. دواتر بۆ بەسرە گەڕانەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك، خالید کوڕی عەبداللەی لەفەرمانداری بەسرە لابرد و براکەی خۆی بشر کوڕی مەرەوانی کردە فەرماندار. ئەمە وتەی دەستەیەك لەمێژونوسانە. بشر بو بەفەرمانداری دوشاری بەسرە و کوفە. بشر بەرەو بەسرە بەرێکەوت و عەمرۆ کوڕی حورەیس لەکوفەدانا.

لەم ساڵەدا، محەممەد کوڕی مەروان شەڕی هاوینەی لەگەڵ رۆمیەکان کرد و ئەوانی شکستدا. هەروەها لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی وەلید شەڕی لەگەڵ رۆمیەکان کرد. ئەو لەئەرمەنستانەوە هاورێ لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر هێرشی کردە سەریان کە شەست هەزار شەڕکەر بون. رۆمیەکان بەبونی ئەم سوپا گەورەیە شکستیان خوارد و بەسەختی کوشتار کران.

هەروەها لەم ساڵەدا حەجاج حەجی کرد. ئەو فەرمانداری مەککە، یەمەن و یەمامە بو. بەوتەی هەندێ کەس، فەرمانڕەوای بەسرە و کوفە بشر کوڕی مەروان بو. دەستەیەك دەڵێن: بشر فەرمانڕەوای کوفە و فەرمانڕەوای بەسرە خالید کوڕی عەبداللە بو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە شورەیح کوڕی حارس و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە هشام کوڕی هوبەیرە بو. بوکەیر کوڕی وەساج فەرمانڕەوایەتی خوراسانی

دەکرد.

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی عومەر لەمەککە مرد و لە زی توا بەخاك سپێردرا. هۆکاری مردنەکەی ئەوە بو کە حەجاج فەرمانی بەیەکێك لەهاوەڵانی خۆیدا تا نوکی ڕمێکی ژەهراویان لەپشتی پێی چەقاند. ئەو لەزیانەکەی نەخۆش کەوت و مرد. حەجاج لەکاتی نەخۆشی ڕۆشتە سەردانی و وتی: کێ ئەم کارەی لەگەڵ تۆ کرد؟ وتی: تۆ کردت چونکە فەرمانت داوە لەشارێکدا کەل و پەلی شەڕ هەڵبگرن کە ڕەوا نیە. ئەو سێ مانگ دوای کوڕی زوبەیر کۆچی دوایی کرد. تەمەنی ٨٧ ساڵ بو.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: سەلیمە کوڕی ئەکوەع، ئەبوسەعیدی خدری، رافیع کوڕی خەدیج، ئەبو غەسان مالك کوڕی میسمەعی بەکری کە بەوتەی هەندێ کەس لەساڵی ٦٨٤/٦٤ زاینی مرد. ئەو لەرۆژگاری پێغەمبەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا، سەلم کوڕی زیاد کوڕی ئوبیە پێش بشر کوڕی مەروان، ئەسما کچی ئەبوبەکر ماوەیەك دوای کوڕەکەی کە کوێر ببو و تەلاقدراوی زوبەیر بو. دەستەیەك دەڵێن: کوڕەکەی عەبدالله بەباوکی وت: لەگەڵ دایکی کەسێکی وەك من کەس نابێت لەسەر جێگە بخەوێت و زوبەیر تەلاقیدا. عەوف کوڕی مالکی ئەشجەعی کە یەکەم شەڕی خەیبەر بو، معاویە کوڕی حودەیج ماوەیەك بەر لەکوڕی عومەر، مەعبەد کوڕی خالیدی جوهەنی لە٨٠ ساڵی و لەهاوەڵانی پێغەمبەر، عەبدولرەحمان کوڕی عوسمان کوڕی عوبەیدالله کە شان بەشانی کوڕی زوبەیر کوژرا کەبرازای تەڵحە کوڕی عوبەیدالله و لەهاوەڵانی پێغەمبەر بو.

## روداوەکانی ساڵی حەفتا وچواری کۆچی ( ٦٩٣ زاییینی )

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك، تارقی لەمەدینە دورخستەوە و حەجاجی کردە فەرماندار. ئەو یەك مانگ لەوێ مایەوە و ئەو کردارەی لەگەڵ یارانی پێغەمبەر کرد کەئاماژەمان پێدا. لەمەدینەوە مەبەستی عەمرەی کرد و هاتەدەر.

هەرەها لەم ساڵەدا حەجاج ئەو بینای وێران کرد کەکوڕی زوبەیر بۆ کەعبە بناغەی داڕشتبو و وەك یەکەم جار دروستی کردەوە و بەردی ڕەشی لەماڵەکە هێنایەدەر. عەبدولمەلیك دەیوت، کوڕی زوبەیر درۆی بەدەم عایشەوە کرد کە وتی، بەردەکە لەناو ماڵەکەدایە. پێیان وت: جگە لەکوری زوبەیر کەسانیتریش ئاماژەیان بەم گێڕانەوەی عایشە لەپێغەمبەرداوە. وتی، خۆزگە وەك خۆی دەمهێشتەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك فەرمانی بە ئەبو ئیدریسی خەولانیدا سەرپەرەستی دامەزراوەی داد لەئەستۆ بگرێت.

## راسپاردنی موهەلیب بۆ شەڕی ئەزرەقیەکان

کاتێك عەبدولمەلیك براکەی بشر کوڕی مەروانی کردە فەرمانداری بەسرە، ئەو بەرێکەوت. نامەی عەبدولمەلیك گەیشت و فەرمانیدا موهەلیب لەگەڵ سەرکردەکان و گەورەکانی بەسرە بۆ شەڕی ئەزرەقیەکان رەوانە بکات. ئەو کەسانێکی هەڵدەبژارد کەدەیویست ئەوان لەشەڕدا لەپشت سەری خۆیەوە بەجێبێڵێت. فەرمانی پێدا کەپیاوێکی بوێر و خاوەن ئەزمون لەخەڵکانی کوفە بەسوپایەکی گەورە بۆپشتیوانی موهەلیب رەوانە بکات. فەرمانی پێدان لەهەر شوێنێك خەواریجی لێ بێت، شوێن پێیان هەڵبگرن و لەناویان ببەن.

موهەلیب، جودەیع کوڕی سەعید کوڕی قەبیصەی رەوانە کرد و فەرمانی پێدا پیاوە شەڕکەران لەتۆمارەکانی دیوان دەستەبژێر بکات. بشر پێ ناخۆش بو کەعەبدولمەلیك فەرماندەیی موهەلیبی پشت راست دەکردەوە. کینەی ئەوی لەدڵ گرت وەك بڵێی موهەلیب گوناحێکی ئەنجام داوە. عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەڤ بانگ کرد وپێی وت: پێگەی خۆت لای من دەزانی، بڕیارمداوە تۆ بکەمە فەرماندەی ئەو سوپایەیی لەکوفەوە رەوانەی دەکەم چونکە بەباشی تۆ دەناسم. گومانەکەی من سەبارەت بەخۆت پشت راست

بکەرەوە و بەم شێوەیە سەیری ئەوپیاوە بکە (جوێنی بەموهەلیبدا). لەکاروبارەکان خۆپەسەندی لەخۆت نیشان بدە و بەهیچ کام لەفەرمانەکانی ئەو رازی مەبە و تا ئەو جێگەی دەتوانیت، ریسوای بکە و.خوازیاری لەناوچونی ئەو بە.

عەبدولرەحمان دەڵێت: لەبیری کرد سەبارەت بەسوپا و جەنگ لەگەڵ دوژمن پێشنیارە پێویستەکان بەمن بڵێت و منی دژی کورە مامەکەم هاندا وەك بڵێی کەسێکی نەزان و گێژم. کەسێکی هاوشێوەی خۆم نەدیوە بەم شێوەیە چاوی تەماح ببڕێتەوە ئەو. کاتێك بینی بۆ وەڵامەکەی دودڵم، وتی: چیت بەسەر دێت؟ وتم: ئایا دەتوانم جگە لەفەرمانی تۆ، ئەوەی دەمەوێت و نامەوێت، ئەنجامی بدەم.

موهەلیب بەرێکەوت تا لەرامهورموز دابەزی و لەوێ روبەروی خەواریج بویەوە و سەنگەری بۆ خۆی دروست کرد. عەبدولرەحمان لەگەڵ خەڵکانی کوفە گەیشتن و ئەم کەسانەی لەگەڵدا بون: بشر کوڕی جەریر، محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کوڕی قەیس، ئیسحاق کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس و زەحر کوڕی قەیس. ئەو بەرێکەوت و لەدوری یەك میل لەموهەلیب دابەزی بەشێوەیەك هەردو سوپاکە لەرامهورموزەوە دەبینران. سوپاییەکان دەرۆژ زیاتر چاوەرێیان نەکرد کەهەواڵی مەرگی بشر کوڕی مەروان گەیشت. ئەو لەبەسرە مرد. زۆر لەخەڵکانی کوفە و بەسرە بڵاوەیان لێکرد. بشر لەبەسرە خالید کوڕی عەبدالله کوڕی خالید و لەکوفە حورەیسی دانا.

لەناو ئەو کەسانەی گەڕانەوە، کەسانی وەك زەحر کوڕی قەیس ونیسحاق کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس و محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەعید دەبینران. ئەوان رۆشتنە ئەهوازو چەندین دەستەی فراوان لەوێ کۆبونەوە. هەواڵی ئەم کارە بەخالید کوڕی عەبدالله گەیشت. نامەی بۆ ئەوان نوسی و فەرمانی پێدان پەیوەستی موهەلیب بن. ئەوانی ترساند کەئەگەر نەگەڕێنەوە، هێرشیان دەکرێتەسەر و دەکوژرێن. هەروەها لەسزای عەبدولمەلیك ئەوانی ئاگادار کردەوە. کاتێك نێردراو یەك یا دو دێر لەنامەکەی خوێندەوە، زەحر وتی: کۆتایی پێ بێنە. کاتێك لەخوێندنەوە تەواو بو، کەس گرنگی پێنەدا. زەحر و هاورێکانی بەرێکەوتن تا گەیشتنە کەنار کوفە وکەسێکیان بۆ لای عەمرۆ کوڕی حورەیس رەوانە کرد کە: دەستەیەك کاتێك هەواڵی مەرگی فەرمانداریان بیست، بڵاوەیان لێکرد و ئێمە رومان کردە شار و بەباشمان زانی تەنیا بەفەرمانی

فەرماندار بگەڕێینەوە بۆ ناوشار. ئەو نامەی بۆ نوسین و سەرکۆنەی گەڕانەوەی ئەوانی کرد و فەرمانی پێدان بۆ لای موهەلیب بگەڕێنەوە. فەرمانی چونە ناو کوفەی پێنەدان. ئەوان چاوەڕوانی شەویان کرد و دواتر ڕۆشتنە ماڵەکانی خۆیان و مانەوە تا حەجاج وەك فەرماندار هاتە کوفە.

## لەسەرکارلابردنی بوکەیر کوڕی وەساج لەخوراسان

**فەرمانداری ئومەییە کوڕی عەبداللە کوڕی خالید**

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك بوکەیر کوڕی وەساجی لەخوراسان لەسەرکار لابرد و ئومەییە کوڕی عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسیدی کردە فەرماندار. فەرمانداری بوکەیر دوساڵی خایاند.

هۆکاری لەسەرکار لابردنەکەی ئەوەبو کەخەڵکی تەمیم لەناو خۆیاندا گرفتاری ناسازگاری بون. هەندێ لەبنەماڵەکان سەرسەختانە لەگەڵ بوحەیر شەڕیان دەکرد و خوازایری بوکەیر بون. ئەوف و کوڕەکانی لەگەڵ بوکەیر شەڕیان دەکرد. ئەمانە هەمویان دەستە و بنەماڵەکانی تەمیم بون. خوراسانیەکان ترسان دوبارە شەڕ دەست پێبکات و شارەکەیان بەرەو لەناو چون بڕوات و ئاگر پەرستەکان بەسەر ئەواندا زاڵ ببن. نامەیان بۆ عەبدولمەلیك نوسی و وتیان: ئەم سەرزەمینە ئارام ناگرێت مەگەر بەپیاوێکی قوڕەیشی کەخراپەی ئەویان نەوێت، شەڕی لەگەڵ نەکەن و ڕژدی پێ نەبەن.. عەبدولمەلیك لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ڕاوێژ کرد بۆ ئەوەی کەسێك بۆ فەرمانداری خوراسان دەست نیشان بکات. ئومەییە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەپیاوێك لەبنەماڵەکەی خۆت ئارامی بۆ ئەو ناوچەیە وەگەڕێنە. وتی: ئەگەر شکست خواردنی تۆ لەئەبو فەدەیك نەدەبو، تۆم ڕەوانە دەکرد. ئومەییە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، شکستم نەخوارد مەگەر دوای ئەوەی خەڵکان بڵاوەیان لێکرد و شەڕکەرکەران دەوریان چۆڵ کردم. بینیم ئەگەر ڕو لەشوێنێك بکەم باشترە لەوەی پاشماوەی موسوڵمانان بەرەو لەناوچون ببەم. عەبداللە کوڕی خالید لەم کارەی من خۆش بو و بەڵگەکانی منی بۆ تۆ نوسی و خەڵك ئەمەیان زانی. عەبدولمەلیك ئەوی وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد. ئەو ئومەییەی خۆش دەویست. خەڵك وتیان: هەرگیز نەمانبینیوە هاوشێوەی ئومەییە کەسێك لەبەرابەر شکست پاداشت بدەن.

کاتێك بوکەیر کوڕی وەساج هەواڵی ڕەوانە بونی ئەوی بیست، کەسێکی بۆ لای بوحەیر لەوەرقا ڕەوانە کرد کە لەزیندانی ئەودابو و لەکاتی کوژرانی کوڕی خازم ئاماژەمان بەچۆنیەتی زیندانی کرانی ئەودا. پێشنیاری ئاشتی پێکرد. بوحەیر ڕازی نەبو و وتی: بوکەیر گومان دەکات خوراسان ڕام و ئارم لەدەستی ئەودا دەمێنێتەوە و کۆمەڵانی خەڵك فەرمانی لێدەبەن. نێردراوەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد و بوحەیر ڕازی نەدەبو. زیرار کوڕی حوصەینی زەببی هاتەلای و وتی: تۆ بەکەسێکی نەزان دەبینم، کوڕە مامەکەت خەڵك ڕەوانە دەکات و داوای بەخشین لەتۆدەکات، تۆ زیندانیت و شمشێر لەدەستی ئەودایە و ئەگەر تۆ بکوژێت، ناتوانیت هیچ کارێك بکەیت، ئەوسا تۆ بەداواکەی ڕازی نابیت! بەئاشتی ڕازی ببە و وەرەدەر و بگەڕێرەوە بۆ سەر کارەکەت. ئەو بەئاشتی لەگەڵ بوکەیر ڕازی بو. بوکەیر چل هەزار درەمی بۆ ڕەوانە کرد و پەیمانی لێوەرگرت شەڕی لەگەڵ نەکات. بوحەیر کوڕی وەرقا هاتەدەر و بەردەوام پرسیاری ئومەییە کوڕی عەبداللەی دەکرد. کاتێك بیستی لەنەیشابور نزیك بۆتەوە، بەرەو لای ئەو بەرێکەوت و لەوێ چاوی پێیکەوت و لەبارودۆخی خوراسان ئاگاداری کردەوە و وپێی وت دەبێت چ کارێك بکات تا خەڵك بەفەرمانبردن ڕازی ببن. ئەو سامانەی لەبوکەیری وەرگرتبو، بۆ ئەوی گەڕاندەوە و ئاگاداری کردەوە کە فێڵ بەکار نەبات و ڕێگەی دەغەڵکاری نەگرێتەبەر. تا مەرو لەگەڵ ئەودا ڕێگەی بڕی. ئومەییە پیاوێکی ڕێزدار و حەزی بەئازاری بوکەیر نەدەکرد و نەیدەویست زیان لەکارگوزارانی ئەو بدات. ئومەییە پێشنیاری بەبوکەیر کرد ببێتە فەرماندەی پاسەوانەکانی ئەو. بوکەیر ڕازی نەبو. ئەوپێشنیارەی بەبوحەیر کوڕی وەرقا کرد. پیاوانێك لەخەڵکی بوکەیر سەرکۆنەیان کرد کەبۆ بەفەرماندەیی پاسەوانەکان ڕازی نەبوە. وتی: تا دوێنی فەرمانداربوم و کەرەستەکانی شەڕیان لەپێش منەوە دەبرد. ئەمرۆ ببمە فەرمانبردار و کەرەستەی شەڕ لەپێش کەسانیترەوە ببەم.

دواتر ئومەییە بوکەیری سەرپشك کرد لەوەی فەرمانداری هەر ناوچەیەك لەخوراسانی دەوێت، بیگرێتە ئەستۆ. ئەو تەخارستانی هەڵبژارد. وتی: خۆت بۆ ڕۆشتن ئامادە بکە. ئەو سامانی زۆر بڵاو کردەوە. بوحەیر بەئومەییەی وت: ئەگەر بڕواتە تەخارستان، ملکەچی فەرمانەکانی تۆ نابێت. ئەوی ئاگادار کردەوە. ئومەییە فەرمانداری

تەخارستانی پێنەدا.

## فەرمانداری عەبدالله کوڕی ئومەییە لەسیستان

کاتێك ئومەییە کوڕی عەبدالله گەیشتە کرمان، کوڕەکەی عەبدالله کوڕی ئومەییەی وەك فەرمانداری سیستان دەستنیشان کرد. کاتێك گەیشتە ئەوێ، لەگەڵ رۆتبیل کەدوای (کوژراوی یەکەم) ببوە پاشا، شەڕی دەست پێکرد. رۆتبیل لەموسوڵمانەکان ترسابو. کاتێك عەبدالله گەیشتە شاری بوست، رۆتبیل پەیك و پەیامی نارد و پێشنیاری ئاشتی کرد. ئەو یەك هەزار درەمی دا و چەندین کەنیز و کۆیلەی بەدیاری بۆ رەوانە کرد. عەبدالله رازی نەبو چونکە پیاوێکی خۆپەسەند بو. وتی: ئەگەر هەیوانێك لەدارایی و زێر و زیو پڕبکەن، چ باشتر و گەرنە بەئاشتی رازی نابم. رۆتبیل رێگەی بۆ کردەوە و لەقولایی شارەکەدا ڕۆچو. دواتر دەروازە و رێرەوەکانی لێ بەست. عەبدالله خوازیار بو دەست لەخۆی و خەڵکەکەی هەڵبگرێت و هیچ نەدات. رۆتبیل رازی نەبو و وتی: سێسەد هەزار درەم وەك بەهای ئاشتی وەربگرێت و پەیمان و سوێند بۆ ئێمە بخوات تا ئەو کاتەی من فەرماندارم هێرش نەکاتە سەر سەرزەمینەکانی ئێمە و کاولکاری دروست نەکات. عەبدالله بەناچاری رازی بو. هەواڵی ئەم کارە بە عەبدولمەلیك گەیشت و ئەوی لەسەر کار لابرد.

## فەرمانداری حەسان کوڕی نوعمان لەئەفریقیە

ئێمە بەفەرمانداری زوهەیر کوڕی قەیس لەکاتی گێڕانەوەی روداوەکانی ساڵی ٦٢/ ٦٨١ زایینی ئاماژەماندا. کوژرانی ئەو لەساڵی ٦٨٩/٦٩ زایینی بو. کاتێك کوژرا، عەبدولمەلیك و موسوڵمانان کوژرانی ئەویان بەگەورە زانی و ئەم کارە بوەهۆی خەمباری عەبدولمەلیك. کێشە و گرفتاریەکانی نێوان خۆی و کوڕی زوبەیر ئەوی لەسەر قاڵ بون بەکاروباری ئەفریقیە دورخستەوە. کاتێك کوڕی زوبەیر کوژرا و موسوڵمانان بۆ فەرمان بردن لەو یەکیان گرت، سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد و فەرماندەیی ئەم سوپایە و ئەفریقیەی بەحەسان کوڕی نوعمانی غەسانی سپارد و ئەوانی لەم ساڵەدا رەوانە کرد. هیچ کات سوپایەکی هاوشێوەی ئەم سوپایە روی نەکردبوە ئەفریقیە.

کاتێك گەیشتە قیروان، خۆی بۆجەنگ ئامادە کرد و لەوێوە بەرەو کارتاژ بەڕێکەوت. خاوەنەکەی گەورەترین پاشای ئەفریقیە بو. موسوڵمانان هیچ کات شەڕیان لەم سەرزەمینە نەکردبو. کاتێك گەیشت، سوپایەکی گەورە وبێ کۆتایی لەرۆمیەکان و بەربەریەکان بینی، گەمارۆی خستە سەریان و شەڕی لەگەڵ کردن و زۆر لەوانی کوشتار کرد. کاتێك ئەمەیان بینی، بۆ هەڵاتن هاودەنگ بون. سوار کەشتیەکانی خۆیان بون، دەستەیەك رویان کردە سیسیل و دەستەیەك بەرەو ئاندۆلۆس بەڕێکەوتن. حەسان بەزۆری شمشێر ڕۆشتە ناو ئەوشارە و ژمارەیەکی زۆری بەئەسیری گرت و تالآنی کرد و کوشتاری کرد و سوپاکەی بۆ دەوروبەری ئەو دیارە رەوانە کرد. ئەوان لەترسا ملکەچی بون و ئەو فەرمانیدا تا ئەتوانن لەکارتاژ کاولکاری بکەن.

دواتر بیستی کە رۆمیەکان و بەربەریەکان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەو لە بنزرت و سەتفورە (دو شاری ئەو سەرزەمینە) کۆبونەوە. بەڕێکەوت و شەڕی لەگەڵ ئەوان دەستپێکرد. ئەوانی بەبەهێز و خۆڕاگر بینی. موسوڵمانان لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگریان کرد. بەسەر شارەکانی ئەواندا زاڵبون و رۆمیەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشتار کرد. حەسان هیچ سەرزەمینێکی بەجێنەهێشت مەگەر ئەوەی لەژێر سمی ئەسپەکانی خۆی و سوپاکەی کاولی کرد. تێکشکاوە رۆمیەکان پەنایان بۆ شاری باجە برد و لەوێ خۆیان حەشاردا. بەربەریەکان لەشاری بونە. حەسان بۆ قیروان گەڕایەوە چونکە بریندارەکان لەناو سوپاکەی فراوان ببون. چەند رۆژێك مایەوە تا بریندارەکان چاك بونەوە.

## کاول کردنی ئەفریقیە

کاتێك خەڵك ئاشتیان کرد، حەسان کوڕی نوعمان وتی: من بۆ لای گەورەترین پاشا لەپاشماوەی شاکانی ئەفریقیە رێنوێنی بکەن. ئەویان بۆ لای ژنێك رێنوێنی کرد کە فەرمانڕەوای ئەفریقیە بو و بەناو و نیشانی ژنی (دین پیشە) دەناسرا. هەواڵی لەجیهانی غەیبەوە بەوان دەدا و لەبەر ئەمە بە دین پیشە ناویان دەبرد. ئەو بەنەژاد بەربەری بو. لەکوێستانەکانی ئەوراس ژیانی بەسەر دەبرد. بەربەریەکان دوای کوژرانی کوسەیلە بۆ فەرمان بردن لەو هاودەنگ ببون. حەسان لەخەڵکی ئەفریقیە سەبارەت بەدین پیشە پرسیاری کرد و ئەوان بەگەورەیان زانی و پێگەکەیان بەرز نرخاند. پێیان

وت: ئەگەر دین پیشە بکوژێت، بەربەریەکان ناسازگاری تۆ ناکەن بەڵکو هەمویان دەبنە فەرمانبرداری تۆ. ئەو بەرەو لای دین پیشە بەرێکەوت. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، ژن قەلای باغایەی وێران کرد بەگومانی ئەوەی حەسان خوازیار و بەدوای قەلاکاندا دەگەرێت. حەسان گرنگی بەم کارە نەدا و روی لەژنە کرد. لەقەراغ روباری نینی روبەروی یەك بونەوە و گەورەترین شەرِیان دەست پێکرد کە خەڵك تا ئەو سەردەمە بینیبویان. موسوڵمانان شکستیان خوارد و دەستەیەکی فراوان لەوان کوشتار کران و دەستەیەکیان بەئەسیری گیران کەژن ئەوانی ئازاد کرد جگە لەخالید کوری یەزیدی قەیسی کە سەروەرێکی بوێر بو و ژن ئەوی وەك منالی خۆی هەڵگرتەوە.

حەسان بەرێکەوت تا لەئەفریقیە دورکەوتەوە و نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و لەروداوەکان ئاگاداری کردەوە. عەبدولمەلیك فەرمانیدا لەوێ بمێنێتەوە تا فەرمانی پێدەگات. ئەو بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەشاری بەرقە مایەوە. لەوکاتەدا ئەوێیان بەکۆشکەکانی حەسان ناودەبرد و تا ئێستایش بەو ناوە بەناوبانگە. ژن سەراسەری ئەفریقیەی خستە  ژێر فەرمانی خۆیەوە و بەشێوەیەکی خراپ لەگەڵ خەڵکەکەی هەڵس و کەوتی کرد و ستەمی فراوانی بەسەر ئەواندا سەپاند.

دواتر عەبدولمەلیك سوپا و سامانی بۆ  رەوانە کرد و فەرمانی پێدا بەرەو ئەفریقیە بەرێکەوێت و لەگەڵ ئەو ژنەدا شەڕ بکات. حەسان بەنهێنی پەیکێکی بۆ خالید کوری یەزید رەوانە کرد کە لای ژنەکە ژیانی بەسەر دەبرد. داوای هەواڵ و چۆنیەتی بارودۆخی دەکرد. خالید بۆی نوسی کە بەربەریەکان بلاوبونەتەوە. داوای لێکرد پەلە بکات و زوتر خۆی بگەیێنێت. نامەیەکی نوسی و لەناو لەتە نانێك شاردیەوە. نێردراو گەرایەوە. ژن هاتەدەر و بەردەوام دەیوت: پاشایەتی لەنێوان ئەوەی دەیخۆن، لەناوچو. بەدوای نێردراودا گەران بەلام نەیاندۆزیەوە. ئەو گەیشتە حەسان و بینی نامەکە لەناگردا سوتاوە. بۆ لای خالید گەرایەوە و سەرلەنوێ نامەکەی نوسیەوە و ئەم جارەیان لەناو زینەکەی شاردیەوە.

حەسان بەرێکەوت و کاتێك ژن لەهاتنی ئەو ئاگادار بویەوە، وتی: عەرەبەکان سەرزەمین و زێر و زیویان دەوێت و ئێمە کێڵگە و لەوەرگاکانمان. بۆچونم وایە دەبێت ئەفریقیە وێران بکەین تا ئەم وەحشیانە بەتەواوەتی لێی هیوابراو ببن. ژن سوپاکەی خۆی بلاو کردەوە تا هەمو شارەکان وێران و خاپور بکەن. شارەکانیان وێران کرد و قەلاکانیان

روخاند و سامانەکانیان تالآن کرد. ئەمە یەکەم وێرانی ئەفریقیە بو.
کاتێك حەسان لەشارەکان نزیك کەوتەوە، دەستەیەك لەرۆمیەکان چاویان پێی کەوت و داوای هاوکاری وپشتیوانی و لەستەمی ژنەکە سکالآیان کرد. ئەو لەم کارە شادمان بو و بەرەو قابس بەرێکەوت. خەڵکەکەی بەسامانی زۆرەوە پێشوازیان لێکرد. پێشتر لەبەرابەر فەرماندارەکانی خۆیان خۆراگریان دەکرد و لەقەلاَکاندا سەنگەریان دەگرت. کەسێکی وەك جێگری خۆی لەو ناوچەیە دەستنیشان کرد و بەرەو قەفصە بەرێکەوت تا رێگەکەی نزیك بکاتەوە. خەڵکەکەی ملکەچی فەرمانەکانی بون و ئەو بەسەر قەستیلیە زالبو و نەفزاوەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە.
ژنی دین پیشە لەهاتنی ئەو ئاگادار بویەوە. دو منالەکەی خۆی و خالیدی بانگ کرد و بەوانی وت: من دەکوژرێم، بڕۆنە لای حەسان و ئەمان بۆ خۆتان وەربگرن. ئەوان رۆشتنە لای حەسان و لەگەڵ ئەو مانەوە. حەسان بەرەو لای ژنەکە رەوانە بو. هەردولا روبەروی یەك بونەوە و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. کوشتار بەرادەیەك فراوان بوکە خەڵك گومانی لەناوچونی سەراسەریان دەکرد. خوا سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی. بەربەریەکان شکستیان خوارد و کوشتار کران. ژنەکە هەلآت کە گرتیان و سەریان بڕی.
بەربەریەکان داوای ئەمانیان لەحەسان کرد. حەسان ئەمانی پێبەخشین و پەیمانی لێوەرگرتن کە لەوان سوپایەك بەرابەر لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەری موسوڵمان بێت و هاورێ لەگەڵ ئەو شەڕی دوژمنەکانی بکەن. ئەوان رازی بون و حەسان دو منالی ئەو ژنەی کردە فەرماندەیان. دواتر ئیسلام لەناو بەربەریەکان بلآوبویەوە و حەسان لەمانگی رەمەزانی ئەم ساڵە/ ژانویەی ٦٩٤ زایینی بۆ قیروان گەڕایەوە و لەوێ نیشتەجێ بو و کەس شەڕی لەگەڵ نەکرد تا عەبدولەلیك مرد.
کاتێك وەلید کوڕی عەبدولەلیك هاتەسەر کار، مامەکەی خۆی، عەبداللە کوڕی مەروانی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقیە دەستنیشان کرد و لەساڵی ٨٩/ ٧٠٨ زایینی موسا کوڕی نوصەیری وەك کارگوزاری خۆی هەڵبژارد کە دواتر بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.
واقدی بەمشێوە دەگێرێتەوە کە ژنی دین پیشە بۆ تۆڵەی کوژرانی کوسەیلە شۆرشی کرد و سەراسەری ئەفریقیەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و ستەمکاری لەناو خەڵکدا بلآو کردەوە و کارە قێزەونەکانی ئەنجامدا. موسوڵمانان دوای کوژرانی زوهەیر کوڕی قەیس لەساڵی ٦٨٦/٦٧ زایینی زیانی زۆریان بەرکەوت. لەبەر ئەمە، عەبدولەلیك، حەسان کوڕی

نوعمانی بەسوپایەکی گەورە رەوانەی ئەفریقیە کرد و ئەو مەبەستی کوشتنی ئەو ژنەی کرد. شەڕ دەستی پێکرد و موسوڵمانان شکستیان خوارد و دەستەیەکی فراوان لەوان کوشتار کران. حەسان شکستی خوارد و بۆ پانتاییەکانی بەرقە گەڕایەوە و تا ساڵی ٤٧/ ٦٩٣ زایینی لەوێ مایەوە. عەبدولمەلیك سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری کردنی ئەو رەوانە کرد وفەرمانی پێدا مەبەستی کوشتنی ئەو ژنە بکات. ئەو شەڕی لەگەڵ ئەو ژنە دەستپێکرد و کوشتی و منداڵەکانی لەناو برد وبۆ قیروان گەڕایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك ژنەکە کوژرا، ئەو بێ درەنگ بۆ لای عەبدولمەلیك گەڕایەوە و کەسێکی بەناوی ئەبو صالح وەك جێگری خۆی دیاری کرد. ئێستا (نشینگەی ساڵح) بەناوی ئەوەوە ناودەبرێت.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی مەدینە، عەبدالله کوڕی قەیس کوڕی مەخرەمە بو، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە شوریەح و بەسرە هشام کوڕی هوبەیرە.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدولمەلیك لەم ساڵەدا حەجی عەمرەی کرد. ئەمە راست نیە.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان بۆ شەڕی هاوینە لەگەڵ رۆمیەکان لەشکرکێشی کرد و لەقولایی سەرزەمینی ئەوان پێشڕەوی کرد تاگەیشتە ئاندۆلییە.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: جابر کوڕی سەمورە، لەکاتی فەرمانڕەوایی بشر کوڕی مەروان لەکوفە، ئەبو جوحەیفە لەکاتی فەرمانڕەوایی بشر کوڕی مەروان لەکوفە، عەمرۆ کوڕی مەیمونی ئەودی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٦٩٤/٧٥ زایینی مرد، ئەو رۆژگاری جاهلی بینیبو و تەمەنێکی درێژی پێبڕابو. عەبدالله کوڕی عوتبە کوڕی مەسعود لەکارگوزارانی عومەر کوڕی خەتاب کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٢/ ٦٩٣ زایینی مرد. عەبدولرەحمان کوڕی عوسمانی تەمیمی لەیارانی پێغەمبەر، محەممەد کوڕی حاتب کوڕی حارسی جومەحی لەسەرزەمینی حەبەشە لەدایك بو و هێنایانە لای پێغەمبەر، ئەبوسەعید کوڕی موعلی ئەنساری، ئەوس کوڕی زەمعەجی کوفی.

## روداوەکانی ساڵی حەفتا وپێنجی کۆچی ( ٦٩٤ زایینی )

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان شەڕی هاوینەی کرد و ئەمە لەکاتێکدا بو ڕۆمیەکان لەلایەن مەرعەشەوە هێرشیان کرد.

## فەرمانداری حەجاج کوڕی یوسف لەعێراق

لەم ساڵەدا عەبدولەلیك، حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی وەك فەرمانداری عێراق (بێ خوراسان و سیستان) دەستنیشان کرد. عەبدولەلیك کاتێك هەواڵی دەستنیشان کردنی ئەوی ڕەوانە کرد کە لەمەدینە بو. فەرمانی پێدا بەرەو ئەو ناوچەیە بەڕێکەوێت. حەجاج لەگەڵ دوانزە پیاوی خاوەن ئەزمون، سوار لەسەر ئەسپە تیژپێکان، بەڕێکەوت و لەکاتی نیمەڕۆدا بەشێوەیەکی لەناکاو ڕۆشتە ناو کوفە. بشر کوڕی مەروان، موهەلیبی بۆ شەڕی خەواریج ڕەوانە کردبو. حەجاج کارەکانی خۆی لەمزگەوتەوە دەست پێکرد. ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان. دەستارێکی سوری لەخەز لەسەر ئالآندبو و روخساری خۆی پێ داپۆشیبو. وتی: خەڵك کۆبکەنەوە. گومانیان کرد خۆی و هاوڕێکانی لەخەواریجن و ئەو لەسەر تەختی وتاردان چاوەڕوانی هاتنی خەڵکانی دەکرد. خەڵك مەبەستی ئەویان کرد. ئەوان کۆبونەوە و ئەو بێدەنگ بو و بێدەنگیەکەی درێژەی کێشا. محەممەد کوڕی عومەیر دەستی پڕ کرد لەخۆڵ و ویستی تێیگرێت. وتی: خوا بیکوژێت، چونکە کەر و قێزەون و ناحەزە. سوێند بەخوا گومانم وایە هەواڵەکەی هاوشێوەی روخساری بێت. کاتێك حەجاج دەستی بەقسە کردن کرد، خۆڵەکە لەدەستی رژایەخوار و نەیدەزانی چ بەلآیەکی بەسەر دێت. دواتر حەجاج روخساری خۆی ئاشکرا کرد و وتی:

انا ابن جلا و طلاع الثنایا      متی اضع العمامة تعرفونی

یانی: من کوڕی بەرەبەیان و کەسێکم بەسەر بەرزی و نزماییەکاندا هەڵدەگەڕێم. کاتێك دەستارەکەم هەلگرم و روخسارم ئاشکرا بکەم، بەباشی دەمناسن.

سوێند بەخوا بەدوای زیاندا دەگەڕێم و لەشوێنی خۆی جێگیری دەکەم و بەهاوتای خۆی سزا و پاداشت دەدەم. بەباشی دەزانم هەندێ کەس پێگەیشتوە و کاتی چنینەوەی ئەوان نزیك بۆتەوە. خوێن دەبینم کە لەسەر دەستارەکان تا سەر ریش دەستی بەبارین کردوە. من بۆ ڕشتنی ئەم خوێنانە قۆڵم هەڵکردوە.

هذا اوان الحرب فاشتدی زیم قد لفها اللیل بسواق حطم

لیس براعی ابل و لاغنم و لا بجزار علی ظهر وضم

یانی: ئێستا کاتی شەڕ هاتوە، کەواتە بۆ جەنگ، ئامادەبەن، شەو لەناو لۆق درێژێکدا کۆی کردۆتەوە کە هەر شتێك لەسەر رێگەی خۆی ببینێت، پێشێلی دەکات. نە لەوەڕێنەری وشترە نە مەڕ و نە بکوژی قوربانیەکان لەسەر پێست یا قوماشێك کە گۆشت لەخاك دور کاتەوە.

دواتر وتی:

قد لفها اللیل بعصلبی اروع خراج من الدوی

مهاجر لیس باعرابی

لیس اوان بکرة الخلاط جاءت به و القلص الا علاط

تهوی هوی سابق الغطاط

یانی: شەو لەخۆیەوە ئالآندی و تەسلیمی پیاوێکی سەرسەختی کرد، ئازایەکی جوان روخسار کە لەناو هاواری شەڕکەران بەسەرفرازیەوە دێتەدەر، کۆچکەری رێگەی خوایە و بیابانگەڕ نیە. لەکاتی جوت بونی وشتری گەنج لەناو خەڵکان یا گۆڕەپانی وشتری تیژپێی بێ ناو و نیشان نەهاتوە، ئەو بۆ فڕاندی نێچیر، وەك مەلی ئاگرخۆرە، لەناکاو لەئاسمانەوە هێرش دەکاتە سەر زەوی.

سوێند بەخوا ئەی عێراقیەکان، ئەهاوشێوەی هەنجیر دەمگوشن نەك وەك ترسنۆکەکان تەپڵ لێدەدەن کە هەڵبێم. ئەوەی کردم، بەپێی وشیاریەکی سەراسەری بو چونکە من مەبەستی دورترین نیشانەکانم کرد. دواتر ئەم ئایەی خوێندەوە: خوا بۆ ئێوە لەشارستانێك داستانێکی گێرایەوە کە ئارام و ئاسودەبو و رۆزیەکەی بەشێوەیەکی فراوان لەهەمو لایەکەوە دەگەیشت. ئەم شارە بەنازەکانی خوا ناباوەڕ بو و خوا جل و بەرگی برسیەتی و ترسی لەبەر کردن چونکە هەمو خەڵکەکەی تاوانبار و خراپەکار بون (نحل/ ١٦/ ١١٢) ئێوە ئەو خەڵکانەن و هاوشێوەی ئەو خەڵکانەن. سەروەری باوەڕداران عەبدولەلیك کوڕی مەروان تیردانی خۆی کردەوە و تیرەکانی تاقی کردەوە و منی بەبەهێزترینیان بینی. منی رەوانە کرد و مەبەستی سینە و جەرگی ئێوەی کرد. ئێوە خەڵکانێکی ستەمکار و خراپەکار و ناسازگار و دو روو و دو رەنگ لەکردارن. درەنگانێکە

بەرێگەی زیاندا دەڕۆن و بناغەی ئایینە گومڕاکەرەکانتان داناوە. بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست. سوێند بەخوا ڕیسواتان دەکەم و شەرابێکی تاڵتان دەرخوارد دەدەم تا لەکاتی خۆیدا شیر بدەن. ئێوە هاوشێوەی دار لەگەڵ ئاگر سازگار دەکەم و وەك دار دڕکاویەکان دەتانبڕم تا دەستەمۆ ببن. هاوشێوەی وشترە یاخیەکان لغاوتان دەکەم تا سەرکێشی لەبیر بکەن و یاخیگەری پشت گوێ بخەن. لەناو هاوەندا دەتانکوتم تا نەرم ببن. سوێند بەخوا هیچ بەڵێنێك نادەم جگە لەوەی بتانگەڕێنمەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و هیچ ئەندازەیەك ناگرم تا چاکسازی لەناو ئێوەدا سەقامگیر بکەم. من لەزیانی ئەم دارودەستانە ئاسودە بکەن. هەر کەسێك سوار دەبێت، بەتەنیای سوار بێت. سوێند بەخوا باوەش بۆ دادپەروەری دەکەنەوە و لەهێرش بردن دەست هەڵدەگرن. گفتوگۆ پشت گوێ دەخەن و تۆ دەڵێیت و ئەو دەڵێت و فلان کەس لەفیسارە کەس ئەو داستانە بۆ من دەگێڕێتەوە، پشت گوێ دەخەن وەگەرنەبۆ هەر پیاوێك لەجەستەی خۆیدا دەبێتە هۆکاری سەرقاڵی! ئێوە لەکوێن و ئەوێ کوێیە؟ سوێند بەخوا لەسەر ڕاستی و دروستی سەقامگیر دەبن یا بەشێوەیەك شمشێر دەخەمە ناوتان کە ژنان بێوە بکات و منداڵەکانتان بێ باوك تا لەناسازگاری خۆتان بەدور بگرن. ئەگەر گوناح بۆ گوناحکار ڕەوا دەبو، باج کۆنەدەکرایەوە و هیچ دوژمنێك سەرکوت نەدەکرا و سنورەکان دەپچڕان. ئەگەر خەڵك بەزۆر بۆ گۆڕەپانی شەڕ نەبەن، بەرەزامەندیەوە ئەو کارە ناکەن.

بیستومە موهەلیبتان لەشەڕ بەجێهێشتوە و گوناحکار و ناسازگار بۆ شارەکەی خۆتان گەڕاونەتەوە. سوێند بەخوا تا سێ ڕۆژیتر کەس لەسوپاکەی بەدور نابینم مەگەر ئەوەی خوێنی بڕێژم و ماڵەکەی وێران و سامانەکەی تالآن بکەم.

دواتر فەرمانیدا و نامەی عەبدولەلیکی بۆ خەڵکانی کوفە خوێندەوە. کاتێك وتی: دوای پاڕانەوە بۆ دەرگای خواوەند، سلاو لەئێوە، من سوپاسی خوا دەکەم.... حەجاج وتی: بێدەنگ بە. وتی: ئەی ئەو خەڵکەی شیاوی داردەستن! سەروەری باوەڕداران سلاو لەئێوە دەکات و کەس وەلاّم ناداتەوە! کاتێك دوبارە وتی: سلاو لەئێوە. هەمویان وتیان: سلاو و خۆشەویستی و پیرۆزیەکانی پەروەردگار لەسەروەری باوەڕداران.

دواتر گەڕایەوە بۆ ماڵ و هیچی بەوتارەکەی زیاد نەکرد. گەورەکانی بانگ کرد و وتی: خەڵکان پەیوەستی موهەلیب بکەن و هەواڵی گەیشتنیان بهێنن. لە ماوەی ئەم زەمانەدا،

دەرگاکانی پرد شەو و ڕۆژ کراوە بێت تا کاتی دیاریکراو بگات.

کاتێك سێیەم ڕۆژ گەیشت، بانگی تەکبیری لەبازار بیست. ڕۆشتە مزگەوت و لەسەر تەختی وتاردان دانیشت و وتی: ئەی خەڵکانی عێراق، ئەی ناسازگاران و خراپەکاران، تەکبیرم بیست بەڵام نەك هاوشێوەی ئەو تەکبیرەی بۆ ڕەزامەندی خوا بێت بەڵکو لەترسا هێناتانە سەر زمان. بەباشی دەزانم دەستەیەکی نەزان و گێژن کە بۆ بەرەڵایی و رابواردن دانیشتون. ئەی منالەکانی کەنیزی پەست، ئەی بەندەکانی داردەست، ئەی کوڕانی بێوەژنان! ئایا کەسێك لەئێوە نیە کەمێك چاوەڕوان بێت، بتوانێت پارێزگاری لەخوێنی خۆی بکات و جێگە پێی خۆی بناسێتەوە؟ سوێند بەخوا بڕیارمدا بەلایەك بەسەر ئێوەدا بێنم بۆ رابردوتان سزا بێت وبۆ داهاتوتان ئامۆژگاری.

لەم کاتەدا عومەیر کوڕی زابی حەنزەلی تەمیمی هەستا و وتی: خوا فەرمانداری ئێمە بپارێزێت، من پیاوێکی بەتەمەن و ئەم کوڕەی من گەنجە. حەجاج وتی: ئەمە باشتر لەباوکی خۆیەتی. دواتر پرسی: تۆ کێیت؟ وتی: عومەیر کوڕی زابی. حەجاج وتی: ئایا وتارەکەی دوێنەکەی ئێمەت نەبیست؟ وتی: بەڵێ. حەجاج وتی: ئایا تۆ ئەو کەسە نیت شەڕت دژی عوسمان کوڕی عەففان کرد؟ وتی: بەڵێ. حەجاج وتی: ئەی دوژمنی خوا، بۆ لەجێگەی عوسمان نەڕۆشتیت؟ چ شتێك بۆ ئەو کارە پاڵی پێوەنایت؟ وتی: عوسمان، باوکمی خستە زیندان کەپیرەپیاوێکی بەتەمەن بو. حەجاج وتی: مەگەر تۆ نەبویت کە وتت:

همممت ولم افعل و كدت و ليتني    تركت على عثمان تبكي حلائله

یانی: مەبەستی کارێکم کرد و نەمکرد. نەوەندەی نەمابو ئەنجامی بدەم. خۆزگە عوسمانم بەشێوەیەك دەکوشت کە ژنان شین و ڕۆڕۆی بۆ بکەن.

دەستەیەك داستانی کوژرانی ئەو بەم شێوەیە دەگێڕنەوە: عەنبەسە کوڕی سەعید کوڕی عاص بەحەجاجی وت: ئایا ئەم پیاوە دەناسیت؟ وتی: نە. وتی: ئەو یەکێك لەبکوژەکانی عوسمانە. حەجاج وتی: ئەی دوژمنی خوا، بۆ لەجێگەی سەروەری باوەڕداران نەکوژرایت (نەڕۆشتیت). دواتر فەرمانیدا و ئەویان کوشت. فەرمانی بەجارچیەکدا کە جاڕیدا: ئاگاداربن کە عومەیر کوڕی زابی بانگەوازەکەی ئێمەی بیستبو و دوای سێ ڕۆژ هات. لەبەر ئەمە فەرمانی کوشتنی ئەومان دەرکرد. ئەمان لەسەر سوپاکەی موهەلیب

هەڵگیراوە ئەگەر ئەمشەو رەوانە نەبن.

خەڵك رۆشتنەدەر و لەژێر پردەکە کۆبونەوە. گەورەکان رۆشتنە لای موهەلیب کە لەرامهورموز بو. نامەیان لێوەرگرت کە پەیوەستی سوپاکەی ئەوبون. موهەلیب وتی: ئەمرۆ پیاوێکی نێر گەیشتۆتە عێراق. ئەمرۆ شەڕ لەگەڵ دوژمن دەستی پێکردوە.

کاتێك حەجاج عومەیر کوڕی زابی کوشت، ئیبراهیم کوڕی عامری ئەسەدی چاوی بە عەبداللە کوڕی زەبیر کەوت. پرسیاری بارودۆخی لێکرد. عەبداللە وتی:

| | |
|---|---|
| اقول لابراهيم لما لقيته | ارى الامر اضحى منصبا متشعبا |
| تجهز و اسرع فالحق الجيش لا ارى | سوى الجيش الا فى المهالك مذهبا |
| تخير فاما ان تزوران ابن ضابى | عميرا و اما ان تزور المهلبا |
| هما خطتا خسف نجاوك منهما | ركوبك حوليا من الثلج اشهبا |
| فحال و لو كانت خراسان دونه | راها مكان السوق او هى اقربا |
| فكائن ترى من مكره الغز و مسمرا | تحمم حنو السرج حتى تحنبا |

یانی: کاتێك چاوم بەئیبراهیم کەوت، پێم وت: دەبینم ئەم کارە چەندین لقی لێبۆتەوە و گرفتاریەکان وەك هەڵۆیەکی راوچی لەئاسمانەوە دەبارن. خۆت بۆ شەڕ ئامادە بکە و پەلەکە چونکە من هەمو شوێنێك جگە لەلەشکرگەکەی موهەلیب بەشوێنی لەناوچون دەبینم. یەکێك لەم دوکارە هەڵبژێرە: یادیدار لەگەڵ عومەیر کوڕی زابی یا دیدار لەگەڵ موهەلیب. دوکاری شەرمێنەرن کەئەگەر دەتوانی هۆکارەکانی رزگاربونی خۆت لەوان بەدەست بێنیت دەبێت سوار چاروێیەکی تیژپێ ببیت کە هاوشێوەی بەفر سپی بێت. زەوی لەنێوان ئەو و سوپا جیایی دروست کرد بەلاّم ئەگەر بەئەندازەی خوراسان دوردەبو، بەنزیکی بازار یا نزیکتر لەوی دەبینی. زۆرن ئەو کەسانەی بەشوێنەکەی خۆیانەوە دەچەقن و خوازیاری شەڕ نین بەلاّم بەناچاری سوار چوارپێکەی خۆیان دەبن و بەشێوەیەك بەزینەوە دەلکێن کەپشتیان دەچەمێتەوە.

دەڵێن: گەیشتنی حەجاج لەمانگی رەمەزان/ ژانویەی ٦٩٥ زایینی بو. ئەو حەکەم کوڕی ئەیوبی سەقەفی وەك فەرمانداری بەسرە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا کاروبارەکان لە عەبداللە کوڕی خالید دژوار بکات. ئەم هەواڵە بە خالید گەیشت کە بەسرەی چۆڵ کرد و لەجەلحا نیشتەجێ بو. خەڵکانی بەسرە بەرێیان کرد و ئەو هەزار هەزار درهەمی لەناو

ئەواندا دابەش کرد.

حەجاج یەکەم کەس بو بۆخۆدزینەوە لەسوپا سزای کوشتنی دیاری کرد. شەعبی دەڵێت: لەرۆژگاری عومەر بەشێوەیەك بو کاتێك کەسێك لەشەڕ خۆی دەدزیەوە، دەستارەکەیان لەسەر هەڵدەگرت و لەناو خەڵکدا ریسوایان دەکرد. لەسەردەمی عەلی و عوسمانیش بەمشێوە بو. کاتێك مەصعەب هاتەسەر کار، وتی: ئەمە بەهای نیە. ئەو تاشینی سەر و ریشی پێ زیاد کرد. کاتێك بشر کوڕی مەروان هاتەسەر کار، فەرمانی دا کەسی لەم شێوەیە بەسەر پێوە رابگرن و بزمار بە بن پێیدا داکوتن و دەستەکانی بەدیوارەوە بدورن. هەندێ کات لەتاو ئازار دەمرد و هەندێ کەس بنی دەستی دەقڵیشا و لەمەرگ رزگاری دەبو. شاعیرێك لەمبارەوە وتی:

لو لا مخافة بشر او عقوبة و ان ینوط فی کفی مسمار

اذا لعطلت ثغری ثم زرتکم ان المحب لمن یهواه زوار

یانی: ئەگەر لەترسی سزا نەدەبو و نەدەترسام کە دو لەپی دەستم بەدیوارەوە دابکوتن، سنورەکانم بەجێدەهێشت و دەهاتمە سەردانتان، دڵبێزراو، بەردەوام سەردانی ئەو کەسانە دەکات کە خۆشی دەوێن.

کاتێك حەجاج هاتە سەر کار وتی: ئەمە گەمەیە. هەرکەس خۆی لەسوپاکەی بدزێتەوە، دەیکوژم.

## فەرمانداری سەعید کوڕی ئەسلەم لەسێندو کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا عەبدولەلیك سەعید کوڕی ئەسلەم کوڕی زورعەی وەك فەرمانداری سیند دەستنیشان کرد. لەوێ معاویە کوڕی حارس و محەممەد کوڕی حارس عەلافی دژی ئەو راپەرین و دەستیان بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. حەجاج، موجاعە کوڕی سیعری تەمیمی رەوانەی سیند کرد کە دەستی بەسەر ئەو سنورەدا گرت و شەڕی کرد و چەندین ناوچەی لەکندابیل گرت. موجاعە یەك ساڵ دوای ئەوە لەموکران مرد. سەبارەت بەو وتیان:

مامن مشاهدك التی شاهدتها الا یزیدك ژکرها مجاعا

یانی: هەمو ئەو شەڕانەی کردت، جگە لەمە هیچ دواهاتێکیان نەبو کەبەردەوام بیرکردنەوەی موجاعەیان بۆ تۆ زیاد کرد.

## بزوتنەوەی خەڵکی بەسرە لەبەرابەر حەجاج

لەم ساڵەدا حەجاج لەکوفەوە بەرەو بەسرە بەرێکەوت و عوروە کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبەی لەکوفە وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. کاتێك ڕۆشتە بەسرە، هاوشێوەی خەڵکانی کوفە قسەی بۆ کردن. ئەوانی ئاگادار کردەوە کە هەر کەس ببینیت دوای سێ ڕۆژ پەیوەستی سوپاکەی موهەلیب نەبوبێت، سزای دەدات. شەریك کوڕی ئەعومری یەشکوری ڕۆشتە لای. ئەو فیتقی هەبو. یەك چاوی بو و پەڕۆیەکی بەچاویەوە دەبەست. لەبەر ئەمە بە(چاوپەمو) بانگیان دەکرد. بەحەجاجی وت: خوا فەرماندارەکەی ئێمە بەهێز بکات. من فیتقم هەیە و کاتێك بشر کوڕی مەروان زانی، منی بەخشی. ئەمە بەخششی منە و بۆ گەنجینەی دەگەڕێنمەوە. حەجاج فەرمانیدا و ئەویان کوشت. لەبەسرە کەس لەسوپاکەی موهەلیب نەمایەوە مەگەر پەیوەستی بو. موهەلیب وتی: پیاوێکی نێر بۆ عێراق هاتوە. خەڵکان بەشێوەیەکی فراوان پەیوەستی ئەو دەبون بەشێوەیەك سوپاکەی گەورە و گەورەتربو.

دواتر حەجاج رویکردە گوندی رستق ئاوا کە لەوێوە تا شوێنەکەی موهەلیب هەژدە فەرسەخ بو. بەردەوام دەیویست پشتی موهەلیب بەخۆی بەهێز بکات. ڕۆژێك لەو گوندە وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: ئەی خەڵکی دوشارەکە، ئێرە دەبێتە شوێنی ئێوە بۆ چەندین ساڵ و چەندین مانگ تا خوا دوژمنانی ئێوە لەناو دەبات. ڕۆژێکیتر وتاریدا و وتی: ئەو زیادەی کوڕی زوبەیر بەئێوە دەبەخشی، زیانبەخشە چونکە پیاوێکی بێدین و خراپەکار ئەنجامی داوە. ئێمە بەڕەوای نازانین. مەصعەب بەخششەکانی هەر کەسێکی بۆ سەد درەم زیاد کردبو.

عەبداللە کوڕی جارود هەستا و وتی: ئەم زیاد کردنە هی کوڕی زوبەیر نیە، لەلایەن سەروەری باوەڕداران عەبدولەلیك کوڕی مەروان فەرمانی زیاد کرانەکە دراوە و بشر کوڕی مەروان بەئەنجامی گەیاند. حەجاج وتی: تۆ بۆ قسە دەکەیت! ئاگات لەسەرت بێت وەگەرنە لەجەستەتی جیا دەکەمەوە! عەبداللە وتی: بۆ؟ من چاکەی تۆم دەوێت و ئەمە قسەی زۆر لەخەڵکانە.

حەجاج دابەزی و یەك مانگ چاوەڕوانی کرد و باسی زیادەی بەخششەکەی نەکرد. دوبارە ئەو باسەی وروژاندەوە. عەبداللە کوڕی جارود وەك جاری پێشو، وتارەکەی

هێنایەوە سەرزمان. مەصقەلە کوڕی کەربی عەبدی (باوکی روقبە کوڕی مەصقەلە کە لەو حەدیس لەپێغەمبەر دەگێڕنەوە) هەستا و وتی: کۆمەڵانی خەڵك کەکۆیلەی رێبەرن، شیاو نیە وتاری شوانەکەی خۆیان بۆ ئەو بگەرێننەوە. ئەوەی فەرماندار وتی، بیستمان و فەرمان دەبەین چ بمانەوێت چ نەمانەوێت. عەبدالله کوڕی جارود وتی: ئەی کوڕی ژنی جەرمەقانی! تۆ کارت بەم کارانە چیە! لەکەیەوە کەسێکی وەك تۆ شیاوە لەم شوێنانەدا قسە بکات.!

گەورەکان رویان لەعەبدالله کوڕی جارود کرد و وتەکانی ئەویان پشت راست کردەوە. هوزەیل کوڕی عومرانی بورجەمی و عەبدالله کوڕی حەکیم کوڕی زیادی موجاشعی و کەسانیتر وتیان: ئێمە لەگەڵ تۆ و یارانی تۆین. ئەم پیاوە دەست هەڵناگرێت تا ئەم زیادەیە کەم بکاتەوە. با لەگەڵ تۆ بەیعەت بکەین بۆ ئەوەی لەعێراق دەریپەڕێنین و نامەی بۆ عەبدولمەلیك بنوسین و داوای لێ بکەین کەسێکیتر وەك فەرمانداری ئێمە دەستنیشان بکات. ئەگەر رازی نەبو، ئەو لەسەر کار لادەبەین چونکە تا ئەو کاتەی خەواریج بونیان هەیە، لەئێمە دەترسێت. خەڵك بەنهێنی بەیعەتیان لەگەڵ کرد و سوێند و پەیمانیاندا و لەیەکتر پەیمانیان وەرگرت.

حەجاج ئاگادار بویەوە ئەوان لەسەر چ کارێك رێککەوتون. لەبەر ئەمە گەنجینەی پاراست. ئەمە لەمانگی رەبیع الثانی ساڵی ٧٦/ ژوئیەی ٦٩٥ زایینی رویدا. عەبدالله کوڕی جارود خەڵکی عەبدقەیسی لەژێر ئاڵاکانیان کۆکردەوە. خەڵکان ڕۆشتنەدەر تا حەجاج بەتەنیا مایەوە و جگە لەکەسانی نزیك و کەسانی بنەماڵەکەی کەس لەگەڵ ئەو نەمایەوە. پێش نیودرۆ ڕۆشتنە لای. کوڕی جارود و هاورێکانی پردەکەیان پچڕاند. گەنجینەکەی حەجاج و کەرەستەکانی شەڕ لەپشتەوە بو. حەجاج، ئەعیەنی بۆ لای کوڕی جارود رەوانە کرد و پەیامیدا کە فەرماندار داوای تۆ دەکات. کوڕی جارود وتی: فەرماندار کێیە!، نا هیچ بەخێرهێنانێك شیاوی کوڕی ئەبو رەغال نیە. دەبێت بەدبەخت و ژێرکەوتو لەناو ئێمەدا بڕوات و گەرنە شەڕ لەگەڵ ئەو دەست پێدەکەین. ئەعیەن وتی: دەڵێت: ئایا شادمان دەبیت لەگەڵ خزم و هاورێکانت بکوژرێیت؟ سوێند بەو کەسەی گیانم لەدەستی ئەودایە، ئەگەر نەیێت خەڵکەکەت بەشێوەیەکی گشتی و کەسانی بنەماڵەکەت بەشێوەیەکی تایبەتی، دەکەمە وانەیەك بۆ داهاتوان. حەجاج ئەم

پەیامەی بۆ کوڕی جارود ناردبو. کوڕی جارود وتی: ئەگەرنێردراو نەدەبویت، دەمکوشتی، ئەی زادەی ژنی خراپەکار! فەرمانیدا و ئەویان بەشێوەیەکی ناشیرین دەرکرد.

خەڵك لەدەوری کوڕی جارود کۆبونەوە. ئەو لەگەڵ ئەوان بەرەو لای حەجاج بەڕێکەوت. مەبەستیان ئەوە بو دەریبپەڕێنن و جیاواز لەوە شەڕ دەست پێبکەن. کاتێك نزیك کەوتنەوە، خێوەتەکەی ئەویان تالآن کرد و هەرچەندە توانیان مەڕومالآت و کالآکانی ئەویان ڕفاند. خەڵکانی یەمان هاتن و هاوسەرەکەی کچی نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساریان برد. موزەریەکان هاتن و هاوسەرەکەیتری ئەویان یانی دایکی سەلە کچی عەبدولرەحمان کوڕی عەمرۆ برای سوهەیل کوڕی عەمرۆیان برد. کۆمەڵانی خەڵك ترسان. دواتر حەجاجیان ئازاد کرد و لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد.

غەزبان کوڕی قوبعەسەری بە کوڕی جارودی وت: پێش ئەوەی بەرخ بەسەر تۆدا نانی نیمەڕۆ بخوات، لەپێش ئەو نانی ئێواری بخۆ. نابینی دەستەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی تۆ پەیوەستی ئەو بون؟ ئەگەر بەیانی بێت، هاورێکانی فراوان دەبن و هاورێکانی تۆ کەم! عەبدالله کوڕی جارود وتی: ئێواری نزیك بۆتەوە، بەرەبەیانی زو هێرش دەکەینە سەری.

عوسمان کوڕی قەتەن و زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکی لەگەڵ حەجاج بون. زیاد فەرماندەی پاسەوانەکانی بەسرە بو. حەجاج بەم دوانەی وت: چی دەبینن؟ زیاد وتی: بۆچونی من وایە لەم خەڵکە بۆ تۆ ئەمان وەربگرم و تۆ بڕۆیت و پەیوەستی سەروەری باوەڕداران بیت چونکە خەڵك لەدەوری تۆ بڵاوەیان لێکردوە و من بەباشی نازانم بەم سوپاکەمە شەڕی ئەو سوپا گەورەیە بکەیت. عوسمان کوڕی قەتەنی حارسی وتی: بەڵام ئەمە بۆچونی من نیە. سەروەری باوەڕداران تۆی لەکارەکەیدا کردۆتە شەریك، تێکەڵاوی کردی، تۆی کردە راوێژکاری خۆی و تۆی بەسەر کاروبارەکاندا زاڵ کرد. تۆ هێرشت کردە سەر کوڕی زوبەیر کەلەهەمو خەڵکان بەرێزتر بو. ئەوت کوشت و سەروەری باوەڕداران پاداشتێکی شیاوی پێ بەخشیتیت. سەروەری باوەڕداران تۆی کردە فەرمانداری حیجاز. دواتر تۆی وەك فەرمانداری دو شاری بەسرە و کوفە دەستنیشان کرد. ئێستا کە بەرەو ئارەزوەکانت دەڕۆیت و گەشتویتە شوێنی مەبەست، سوار وشترێك دەبیت و ڕێگەی شام

دەگریتەبەر! سوێند بەخوا ئەگەر ئەو کارەبکەیت، نە لای عەبدولەلیك پێگەی ئێستات دەمێنێت، نەخۆت لەریسوابون و فەوتان دەپارێزیت. بۆچونم ئەوەیە شمشێرەکان بەدەستەوە بگرین و بەهاوکاری تۆ شەڕی ئەوان بکەین تا سەرکەوین یا پیاوانە بمرین. حەجاج وتی: بۆچونی راست ئەوەیە. ئەم ئامۆژگاریەی عوسمان کوڕی قەتەنی بیرمایەوە و لەوتەکانی زیاد کوڕی عەمرۆ کینەی بەدڵ گرت.

عامل کوڕی میسمەع هاتە لای حەجاج وتی: بۆ تۆ لەخەڵکان ئەمانم وەرگرتوە. حەجاج دەنگی خۆی بەشێوەیەك بەزر کردەوە تا خەڵکان ببیستن، دەیوت: سوێند بەخوا ئەمانیان پێ نادەم تا هوزەیل کوڕی حەکیم بێننە لای من. کەسی بۆ لای عوبەید کوڕی کەعبی نەمیری رەوانە کرد و پەیامیدا: بۆ لای من وەرە و بمپارێزە. وەڵامی دایەوە: ئەگەر بێیت بۆ لای من، دەتپارێزم. حەجاج وتی: نامەوێت وڕێزت لێ ناگرم. کەسی بۆ لای محەممەد عومەیر کوڕی عوتارد رەوانە کرد و هەمان داواکاری لەگەڵدا باس کرد و هەمان وەڵامی بیست. محەممەد زیادی کرد: من لەم کارەدا هیچ وشترێکی نێر یا مێچکەم پێنابرێت. کەسی بۆلای عەبداللە کوڕی حەکیمی موجاشعی رەوانە کرد و هەمان وەڵامی بۆ گەڕایەوە.

عەباد کوڕی حوصەین لای کوڕی جارود و کوڕی هوزەیل و عەبداللە کوڕی حەکیم تێپەڕی کە لەسوچێکدا وەستابون و بەنهێنی لەگەڵ یەك قسەیان دەکرد. بەوانی وت: ئێمە لەگفتوگۆکەی خۆتان ئاگادار بکەنەوە. وتیان: دوربێت کە کەس لەبەنی حەبت نابێتە شەریکی گفتوگۆکانی ئێمە! ئەو تورە بو و هاوڕێ لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر پەیوەستی حەجاج بو. حەجاج وتی: دوای هاتنی تۆ، ترسم نیە خەڵکان پەیوەستم ببن یا نەبن.

قەتیبە کوڕی موسلیم لەناو خەڵکەکەی لە(یحیی اعصر)کەوتە جموجوڵ و وتی: سوێند بەخوا رێگە نادەم قەیس (یانی حەجاج) بکوژن یا سامانەکەی تاڵان بکەن. ئەویش پەیوەستی حەجاج بو.

حەجاج لەژیان بێ هیوا ببو. کاتێك ئەوان هاتن، ئارامی پێبڕا. دواتر سەبرە کوڕی عەلی کەلابی و سەعید کوڕی ئەسلەم کوڕی زورعە هاتنە لای. سەعید سڵاوی لێکرد و حەجاج لەخۆی نزیکی کردەوە. جەعفەر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی میخنەف ئەزدیش

پەیوەستی بو و میسمەع کوڕی مالگ پەیامی بۆ نارد کە: ئەگەر دەتەوێت پەیوەستی تۆ دەبەم و ئەگەر بخوازیت دەمێنمەوە و خەڵك لەشەڕ کردن لەگەڵ تۆ دوردەکەمەوە. وەڵامی دایەوە: بمێنەرەوە و خەڵك لەشەڕ کردن لەگەڵ من دوربکەرەوە.

کاتێك ئەو خەڵکانە لای حەجاج کۆبونەوە کە بەوان دەیتوانی پارێزگاری لەخۆی بکات، هاتەدەر و سوپاکەی خۆی ڕێکخست. خەڵکان بەردەوام پەیوەستی دەبون. کاتێك بەرەبەیان بویەوە، بینی شەش هەزار پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆبونەتەوە. ئاماژەیان بەگێرانەوەی دیکەیش داوە. عوبەیدالله کوڕی زیاد کوڕی زەبیان وتی: بۆچونی راست چیە؟ وتی: بۆچونی راستت پشت گوێ خست کە غەزبان بیری خستیتەوە. پێش ئەوەی بەرخ لەسەر تۆ نانی نیمەڕۆ بخوات، نانی ئێواریێ بخۆ. ئێستا تەنیا خۆڕاگری ماوەتەوە.

کوڕی جارود داوای زرێیەکی کرد و بەپێچەوانەوە لەبەری کرد و ئەمەی بەخراپ لێکدایەوە. حەجاج هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ هاندا و وتی: فراوانی ئەوان نەبێتە هۆی ترسی ئێوە. خەڵك روبەروی یەك بونەوە. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی کوڕی جارود هوزەیل کوڕی عیمران و فەرماندەی باڵی چەپ عوبەیدالله کوڕی زیاد کوڕی زەبیان. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی حەجاج قوتیبە کوڕی موسلیم یا عەباد کوڕی حوصەین و فەرماندەی باڵی چەپ سەعید کوڕی ئەسلەم. کوڕی جارود لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی دەستپێکرد تا سوپاکەی حەجاجی بەجێهێشت. حەجاج گەڕایەوە و هێرشی کردەسەر. کاتژمێرێك شەڕیان کرد وئەوەندەی نەمابو سوپاکەی کوڕی جارود سەرکەوتن بەدەست بێنن. لەناکاو تیرێك لەتیرهاوێژێکی نەناسراو بەرکوڕی جارود کەوت و کوژرا. جارچیەکەی حەجاج ئەمانی بەخەڵك پێشنیارکرد جگە لەهوزەیل کوڕی عیمران و عەبدالله کوڕی حەکیم. فەرمانیدا شوێن هەڵاتوان نەکەون. وتی: شوێنکەوتنی خەڵك، نیشانەی سەرکەوتنێکی ناسازگار و ناپەسەندە. عوبەیدالله کوڕی زیاد کوڕی زەبیان شکستی خوارد وهەڵات. ئەو ڕۆشتە عەممان بۆ لای سەعید کوڕی عەیاز کوڕی جولەندی ئەزدی. بەسەعیدیان وت کە عەبدالله پیاوێکی خوێنرێژە، خۆت لەو بەدور بگرە. کاتێك کاڵکی تازە پێگەیشتو هاتە بازار، سەعید نیوە کاڵکێکی ژەهراوی بۆ عەبدالله نارد و وتی: ئەمە یەکەم کاڵکە کە هاتۆتە بازارەوە، نیوەیم خوارد ونیوەیم بۆ تۆ رەوانە کرد. عوبەیدالله کەمێکی خوارد و هەستی بەزیانەکەی کرد و وتی: دەمویست

بیکوژم، بەڵام ئەو دەستی پێشخست و منی کوشت.

سەری کوڕی جارود و هەژدە کەس لەگەورەکانی کوفەیان بۆ لای موهەلیب رەوانە کرد و ئەوانیان کرد بەسەری ڕمەکانەوە تا خەواریج ببینن و دڵ بەدژایەتیەکان خۆش نەکەن.

حەجاج، عوبەید کوڕی کەعب و محەممەد کوڕی عومەیر کوڕی عوتاردی خستە زیندان چونکە ئەم دوانە پەیامیان پێدابو کە: بۆ لای ئێمە وەرە تا بتپارێزین. غەزبان کوڕی قەبعەسەری خستە زیندان و وتی: تۆ بویت کە وتت: پێش ئەوەی بەرخ لەسەر تۆ نانی نیمەڕۆ بخوات، نانی ئێوارێ لەسەر ئەو بخۆ؟ غەزبان وتی: من لەوتەکەی خۆم سودم نەبرد و تۆ زیانت بەرنەکەوت. عەبدولمەلیك نامەی بۆ حەجاج نوسی وفەرمانی پێدا ئازادی بکات.

هاورێ لەگەڵ کوڕی جارود عەبداللە کوڕی ئەنس کوڕی مالکی ئەنساری کوژرا. حەجاج وتی: ئایا ئەمە سەیر نیە ببینم ئەنس خەڵك بۆ شەڕ دژی من هانبدات! کاتێك هاتە بەسرە، دەستی بەسەر سامانەکەی ئەودا گرت و کاتێك ئەنس ڕۆشتە لای، پێی وت: شوێنکەت پێ لێژ کردین و بەخێر نەهاتیت، ئەی کوڕی ژنی سرشت پیس! پیرێکی گومڕا کەبەردەوام ئاژاوە دەنێتەوە. جارێك لەگەڵ ئەبو تورابە، جارێك لەگەڵ کوڕی زوبەیر و جارێك لەگەڵ کوڕی جارود. سوێند بەخوا وەك لقی بڕاو پێستت دادەماڵم وەك داری دڕکاوی دەتبڕم. ئەنس وتی: مەبەستی فەرماندار کێیە؟ حەجاج وتی: تۆ، خوا زمانت لاڵ بکات. ئەنس گەڕایەوە و نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و لەحەجاج و هەڵس و کەوتی ئەو سکاڵای کرد. عەبدولمەلیك بۆ حەجاجی نوسی:

دوای سڵاو، ئەی کوڕی دایکی حەجاج، تۆ کۆیلەیەك بویت کە کۆمەڵێك کار بونە هۆی ئەوەی پێگەی تۆ بەرز بویەوە تا ئەوەی سنوری خۆتت بەزاند. ئەی زادە ژنی نێوان تەنگ، ئەگەر کەمێك گوشارت بخەمەسەر، هاوشێوەی ئەوەی شێرەکان لەرێویەکانی دەکەن، بەشێوەیەك لەناوت دەبەم کە ئارەزو بکەیت لەناو قاچی دایکتەوە بگەڕێیتەوە بۆ ناو سکی. ئایا رۆژگاری باوك و باوکانت لەتایف بیرناهێنیتەوە کە بەردیان بەکۆڵ دەکێشا و لەدۆڵە وئەستێرەکان بەدەستی خۆیان چاڵیان هەڵدەکەند؟ ئایا رۆژگاری باوکت لەریسوایی و بەدبەختی و قوڕبەسەری بیرناهێنیتەوە؟ هەواڵیان بەسەرومری باوەڕداران

گەیاند کە هاوشێوەی کەسێکی خۆپەسەند چۆن هەڵس و کەوتت لەگەڵ ئەنس کوڕی مالك کرد. گومانی من ئەوەیە مەبەستی ئەوەت کرد ئاستی لێکۆڵینەوەی سەروەری باوەڕداران سەبارەت بەکاروبارەکانی خۆی بزانیب و تێ بگەیت تا چەندە دژایەتی تۆ دەکات تا لەتۆ خۆش دەبێت. ئەگەر دەبینی چاوپۆشی لەتۆ دەکات، یەکسەرە بەرەو روی دەڕۆیت. نفرینی خوا لەتۆبێت کەپیاوێکی نیوەکوێریت، هەنگاوەکانت سست و لاوازن. ئەگەر گومانم لەوە نەدەکرد کە نوسەری نامەکە کەمێك زێدەڕۆیی کردوە، کەسێکی رەوانە دەکرد تا تۆ لەسەر تەخت لاببات و بتخاتە زیندانەوە. دواتر تەسلیمی ئەنست بکات تا فەرمانی پێویست سەبارەت بەتۆ بدات. رێز لەئەنس و بنەماڵەکەی بگرە و مافەکانی بەرەوا بزانە و خزمەتی ئەوت بۆ پێغەمبەر لەبیر بێت و لەدابین کردنی نیازەکانی کەمتەرخەمی مەکە. با هەواڵ بەسەروەری باوەڕداران نەگات کەجگە لەداوای لێخۆشبون کارێکیتر بەرابەر بەئەنس ئەنجام بدەیت چونکە کەسێك رەوانە دەکات تا پشتت بەقامچی رەش و شین بکات و رێزی تۆ بشکێنێت و دوژمنەکەت شادمان بکات. لەماڵەکەی خۆی برۆ سەردانی و شەرمەزار بگەرە لای. دەبێت بۆ سەروەری باوەڕداران بنوسێت کە لەتۆ رازی و رەزامەندە، ئەگەر خوا بیەوێت، ماڵئاوا.

نامەکەی بەئیسماعیل کوڕی عەبدالله موالی بەنی مەخزوم رەوانە کرد. ئیسماعیل نامەی سەروەری باوەڕدارانی بردە لای ئەنس کەخوێندیەوە. نامەی حەجاجی گەیاندە دەستی. حەجاج نامەکەی دەخوێندەوە و روخساری رەنگ بەرەنگ دەبو ولەناوچاوی عارەق دەباری. دەم بەدەم بەردەوام دەیوت: خوا سەروەری باوەڕداران ببەخشێت. دواتر حەجاج بەشێوەیەکی چاکە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەنس کرد و رێزی گرت و داوای لێخۆشبونی کرد و وتی: ویستم عێراقیەکان بزانن ئەگەر کوڕەکەی تۆ کارێکی ئەنجامدا و من لەگەڵ تۆ و ئەو، ئەو هەڵس و کەوتە بکەم، بۆ سزادانی ئەوان بەپەلەترم.

ئەنس وتی: گلەییم نەبردە لای سەروەری باوەڕداران تا کاسەی سەبرم سەرریژ بو. گومانی ئەوەت کرد کە ئێمە خراپەکارانین لەکاتێکدا خوا ئێمەی بەئەنسار ناوبردوە. وات دەزانی ئێمە دوروو و دو رەنگین لەکاتێکدا دەرگای ماڵەکانی خۆمان بۆ پێغەمبەر ئاوەلا کرد. بەزویی خوا لەنێوان من و تۆ داوەری دەکات چونکە ئەو توانای گۆڕانکاری هەیە. لای خوا راستی و دروستی تێکەڵ بەخواری و چەوتی نابن. گومانت کرد منت

کردە بیانوێك بۆ ترساندنی عێراقیەکان بەڵام ئەم کارە لەرێگەی رەوا کردنی ئەو شتانەوە بو کە خوا نارەوای کرد. خوا بەرەوای نەزانی تۆ ئەو هەڵس و کەوتە لەگەڵ من بکەیت. من دەسەڵاتم بەسەر تۆدا نەبو لەبەر ئەوە کارەکەی خۆم تەسلیم بەخوا و سەروەری باوەڕداران کرد و ئەو مافێکی بۆ من پاراست کە تۆ نەتبو. سوێند بەخوا ئەگەر مەسیحیەکان پیاوێك ببینین کە تەنیا یەك رۆژ خزمەتی عیسا کوڕی مریەمی کردبێت، بەشێوەیەك رێزی لێدەگرن کە تۆ نەتزانی لەگەڵ ئەوەی من دە ساڵ نۆکەری پێغەمبەری خوام کرد. سەرەرای هەمو ئەمانە، ئەگەر چاکە ببینم، سوپاسی خوا دەکەم و ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت، خۆڕاگری دەکەمە پیشە، هەمیشە داوای هاوکاری لەخوا دەکەم.

حەجاج سامانەکەی کەدەستی بەسەردا گرتبو، بۆ ئەوی گەڕاندەوە.

## شێری زەنگی و زەنگیانی هاورێی ئەو

لەدوایین رۆژەکانی فەرمانڕەوایی مەصعەب کوڕی زوبەیر، خەڵکانی زەنگ لەفورات کۆبونەوە، بەڵام لەژمارەدا فراوان نەبون. خراپکاریان کردو میوەی فراوانی خەڵکانیان لەناوبرد. کاتێك خالد کوڕی عەبداللە کوڕی خالد بوبە فەرمانداری بەسرە، ژمارەی ئەوان زیادی کردبو. خەڵك لەو بەڵای زەنگیەکان بەسەریاندا هێنابویان، سکاڵایان کرد. ئەو سوپایەکی ئامادە کرد. کاتێك هەواڵی بڵاوبونەوەی ئەوانی بیست، دەستەیەك لەوانی گرت و کوشتاری کرد.

کاتێك عەبداللە کوڕی جارود ئەو بەڵای بەسەرهات کە ئاماژەمان پێدا، خەڵکانی زەنگ بزوتنەوەکەی خۆیان دەستپێکرد و دەستەیەکی زۆر لەوان لەفورات کۆبونەوە و پیاوێك بەناوی ریاح بەنازناوی (شێری زەنگی)یان وەك رێبەر و فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد. ئەوان خراپەکاریان ئەنجام دەدا. کاتێك حەجاج لەشەڕی کوڕی جارود تەواو بو، فەرمانی بە زیاد کوڕی عەمرۆ سەرکردەی پاسەوانەکانی بەسرەدا سوپایەك بۆ شەڕی ئەوان رەوانە بکات. ئەم کارەی کرد و سوپایەکی بەسەرکردایەتی حفص کوڕی زیاد رەوانە کرد کەئەوانیان تێکشکاند و کوڕەکەی ئەو حفص کوڕی زیادیان کوشت. دواتر سوپایەکیتری رەوانە کرد کە خەڵکانی زەنگی تێکشکاند و کوشتاری کرد و ئارامی بۆ بەسرە گەڕایەوە.

## دەرپەڕاندنی خەواریج لەرامهورموزو کوژرانی کوڕی مێخنەف

کاتێك نامەی ِ حەجاج بەموهەلیب و کوڕی مێخنەف گەیشت و فەرمانی پێدان بەشێوەیەکی سەختیگرانە دریژەی بەشەڕی خەواریج بدەن، ئەوان پێشڕەویان دەست پێکرد و ماوەیەك شەڕیان لەگەڵ کردن کەخەواریج نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن و هەڵاتن وەك بڵێی لەسەر زەویەکی سورەوەبو بەرێگادا دەڕۆشتن. هیچ شەرێك لەخەواریج نەبینرا. خەواریج بەرێکەوتن و لەکازەرون دابەزین. موهەلیب و کوڕی مێخنەف بەرێکەوتن و لەنزیك ئەوانەوە ئوردویان لێدا. موهەلیب سەنگەری بۆخۆی هەڵکەند و بەکوڕی مێخنەفی وت، ئەگەر دەتەوێت سەنگەرێك بۆ خۆت هەڵکەنە. یارانی ئەو وتیان؛ سەنگەری ئێمە شمشێرەکانمانە.

خەواریج هێرشیان کردەسەر موهەلیب تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی بکەنەسەر بەڵام بینیان ئەو خۆی بەهێز کردوە. رویان کردە کوڕی مێخنەف و بینیان لەدەوری خۆیان سەنگەریان هەڵنەکەندوە. شەڕیان دەست پێکرد کە هاوەڵانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان کرد و رایانکرد. ئەو دابەزی و لەگەڵ دەستەیەك لەیارانی شەڕی کرد کەکوڕی مێخنەف کوژرا و هاورێکانی لەدەوری ئەو گیانیاندا. شاعیرەکەی ئەوان وتی؛

لمن العسكر المكلل بالصر    عى فهم بين ميت و قتيل

فتراهم تسفي الرياح عليهم    حاصب الرمل بعد جر الذيول

یانی؛ ئەو سوپا رازاوە بەخەوتوان لەخاك و خوێندا هی کێیە؟ دەستەیەك لەوان کوژراون و دەستەیەك گیانیان بەخشیوە. دەبینی بایەکی خۆڵپرژێن بەسەر ئەواندا هەڵیکردوە، پێش ئەمە خەرامان لێرەوەبەرەو گۆڕەیان دەڕۆشتن.

ئەمە گێڕانەوەی خەڵکانی بەسرەیە.

بەڵام خەڵکانی کوفە دەڵێن، کاتێك نامەکەی حەجاج گەیشت و فەرمانی شەڕی لەگەڵ خەواریج دەرکرد، موهەلیب و عەبدولرەحمان شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. خەواریج هێرشیان کردە سەر سوپاکەی موهەلیب و ئەویان ناچار بەپاشەکشێ کرد. موهەلیب کەسی بۆ لای عەبدولرەحمان رەوانە کرد و داوای هاوکاری کرد. عەبدولرەحمان سوارە وپیادەکانی بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد. ئەمە، دوای نیمەڕۆ، دە شەو بۆ کۆتایی رەمەزان/ ١٢ ژانویەی ٦٩٥ زایینی بو.

کاتێك، کاتی نوێژی ئێوارێ گەیشت و خەواریج بینیان هێزە پشتیوانەکان بەردەوام بۆ سوپاکەی موهەلیب دەگات، گومانیان کرد کە هاورێیانی ئەو کەم بونەتەوە. کەواتە چەند دەستەیەکیان لەبەرابەر سوپاکەی موهەلیب دانا تا بەشەڕ سەرقاڵی بکەن، دواتر بەسوپاکەی خۆیان رویان لە عەبدولرەحمان کرد. کاتێك بینی خەواریج مەبەستی ئەویان کردوە، دابەزی و قورئان خوێنەکانی سوپاکەی دابەزین و مەبەستی خەواریجیان کرد. ئەمە کەسانە لەناویاندا بون: ئەبو الاحوەص هاورێی عەبدالله کوڕی مەسعود و خوزەیمە کوڕی نەصر باوکی نەصر کوڕی خوزەیمەی عەبسی کە لەگەڵ زەید کوڕی عەلی کوژرا و هاورێ لەگەڵ ئەو لەداردرا. لەگەڵ ئەو حەفتا و یەك کەس لەهاوەڵانی دابەزین. خەواریج هێرشیان کردە سەریان و ئەو شەری لەگەڵ ئەوان کرد و خەڵك لەدەوری بڵاوبونەوە و لەگەڵ دەستەیەکی کەم لەیارانی خۆی مایەوە کەپیاوانە شان بەشانی ئەو خۆڕاگریان دەکرد. کوڕکەی جەعفەر کوڕی عەبدولرەحمان لەو کەسانە بو کە بۆ هاوکاری کردنی موهەلیب رەوانەی کردبو. ئەو لەناو خەڵك هاواری کرد و داوای لەخەڵك کرد هاورێ لەگەڵ ئەو بۆ هاوکاری باوکی بەرێکەون. جگە لەدەستەیەکی کەم لەخەڵکان کەس لەگەڵی نەڕۆشت. بەرێکەوت و خۆی لەباوکی نزیك کردەوە بەڵام خەواریج جیاییان لەنێوان ئەواندا دروست کرد. عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف و هاورێکانی ڕۆشتنە سەر تەپۆڵکەیەکی بەرز و دوبەشی شەو شەڕیان کرد تا ئەوەی خۆی و شەڕکەرانی هاورێی کوژران. کاتێك شەویان گەیاندە بەیانی، موهەلیب هات و نوێژی لەسەر خوێند وبەخاکی سپارد وئەم هەواڵەی بۆ حەجاج نوسی. حەجاج هەواڵەکەی بە عەبدولەلیك گەیاند کەسلاوی بۆ نارد و سەرکۆنەی خەڵکانی کوفەی کرد.

حەجاج، عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب کوڕی وەرقا ی بۆ لەشکرگەکەی موهەلیب رەوانە کردو فەرمانی پێدا گوێرایەڵی فەرمانەکانی موهەلیب بێت و ئەنجامیان بدات. ئەو ئەم فەرمانەی پەسەند نەکرد بەڵام بینی هیچ رێگە چارەیەکی نیە. ڕۆشتە لەشکرگە و شەڕی لەگەڵ خەواریج دەست پێکرد و فەرماندەکەی موهەلیب بو بەڵام خۆی کاروبارەکانی رێکدەخست و راوێژی لەگەڵ موهەلیب نەدەکرد. موهەلیب چەندین پیاوی فریودا و بۆ ئاگاداربون لەکاروباری عەتاب رایسپاردن (ئەگەری هەیە بەمەبەستی ئازاردان یا کوشتنی لەناکاو). یەکێك لەوان بەستام کوڕی مەسقەلە کوڕی هوبەیرە بو.

رۆژێك لەنێوان موهەلیب و عەتاب دەمەقاڵێ دروست بو و هەرکام بەتوندی لەگەڵ ئەویتر قسەی کرد. موهەلیب قامچی هەڵگرت تا لەسەری عەتاب بدات، کوڕەکەی موغەیرە کوڕی موهەلیب لەشوێنەکەی هەستا و قامچیەکەی لەدەستی باوکی دەرهێنا و وتی: خوا فەرماندە لەسەر چاکەکاری بهێڵێتەوە! پیرێك لەپیرەکانی عەرەب و گەورەیەك لەگەورەکانی ئەوانە. ئەگەر وتارێکی ناپەسەندت لەو بیستوە، باری قورسی ئەو بەسوکی هەڵبگرە چونکە شیاوە بۆ ئەم کارە. موهەلیب رازی بو و ئەم دوانە لەیەك جیابونەوە. عەتاب کەسی بۆ لای حەجاج رەوانە کرد و سکاڵای لەموهەلیب کرد و داوای کرد فەرمانی گەڕانەوەی بدات. ئەم کارە لەگەڵ نیازی حەجاج لەبابەتێکی تایبەت یەکی دەگرتەوە کە لەگەورەکانی کوفە سەبارەت بە کاری شەبیب نارەزامەند بو. ئەو عەتابی گەڕاندەوە و فەرمانی پێدا لەو سوپایەی کە لەژێر دەستی موهەلیبدایە خۆی بەدور بگرێت و بۆ لای خۆی (حەجاج) بگەڕێتەوە. موهەلیب کوڕەکەی خۆی حەبیبی کردە فەرماندەی ئەو سوپایە.

سوراقە کوڕی مێرداسی بارقی لەپرسەی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف وتی:

| | |
|---|---|
| ثوی سید الازدين ازد شنوءة | و ازد عمان رهن رمس بکازر |
| و ضارب حتى مات اكرم ميتة | بابيض ضاف كالعقيقة باتر |
| و صرع عند التل تحت لوائه | كرام المساعی من كرام المعاشر |
| قضى نحبه يوم اللقاء ابن مخنف | و ادبر عنه كل الوث داثر |
| امد و لم يمدد فراح مشمرا | الى الله لم يذهب باثواب غادر |

یانی: سەروەری دو تیرە لەخەڵکانی ئەزدی عەممان و ئەزدی شنونە لەکازەرون سەری خستە ژێر خاك. بەشمشێرێکی سپی و تیژ و بڕەر وەك ئەڵماس شەڕی دەکرد و تێدەکۆشا تا پیاڵەی گیانبەخشی هەڵدا. لەداوێنی تەپۆڵکە لەژێر ئاڵاکەی ئەو پیاوانێکی تێکۆشەر کوژران. کوڕی مێخنەف لەرۆژی شەڕ بەرێگەی خۆیدا ڕۆشت و هەر داوێن پیسێك لەهاوکاری کردنی ئەو بەجێما. هاوکاری کەسانیتری کرد بەڵام ئەوان فریایی نەکەوتن و لەبەر ئەمە بەسەربڵندیەوە ڕۆشتە دیداری خواوەند و بەجل و بەرگی خراپەکاران نەڕۆشتە بارەگاکەی ئەو.

موهەلیب لەشاپور مایەوە ویەك ساڵ لەوێ شەڕی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا صاڵح کوڕی موسەرەح یەکێك لەپیاوانی ئەمرۆئەلقەیس کوڕی زەید کوڕی مەنات لەتەمیم، کەوتە جموجۆڵ. ئەو لەسەر باوەڕی (صوفەریەکان) بو. یەکەم کەس لەم دەستەبو کە هاتەدەر. ئەو بۆ لای حەجاج بەرێکەوت و شەبیب کوڕی یەزید و سوەید و بەتین و کەسانیتر هاورێیەتیان دەکرد.

ئایینی حەج لەم ساڵەدا عەبدولەلیك کوڕی مەروان ئەنجامیدا. شەبیبی خارجی بڕیاریدا بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژێت. ئەم هەواڵە بەعەبدولەلیك گەیشت. دوای گەڕانەوە نامەی بۆ حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی نوسی وفەرمانی پێدا شوێن پێیان هەڵبگرێت. پیرەپیاوێکی چاکەکار و شیاوبو. دەهاتە کوفە وبۆ ماوەی یەك مانگ دەمایەوە و سەردانی هاورێکانی خۆی دەکرد و نیازەکانی بۆ دابین دەکردن. کاتێك حەجاج بەدوایدا گەڕا، لەکوفەدا جێگەی نەبویەوە و بەجێی هێشت.

کاتێك حەجاج بۆ حەج ڕۆشت، ڕۆشتە مەدینە و قسەی بۆ خەڵك کرد و دوای سوپاس کردنی خوا وتی: ئەی خەڵکینە، من ئەخەلیفەی هەژار، عوسمانم، ئەخوێنسارد و ئاشتی خواز وەك معاویە و نە باوەڕ سست وەك یەزید. ئاگادار بن من ئەم ئۆمەتە تەنیا بەشمشێر دەهێنمە سەر رێگەی راست تا داری ڕمەکەی ئێوە راست ببێتەوە. ئێوە کاری یەکەمی کۆچکەرانی خوا باس دەکەن و شانازی بەوان دەکەن و چاوەڕوانی هەڵس و کەوتێکی هاوشێوەی ئەوانن لەئێمە، بەلام کردارتان وەك ئەوان نیە. داوای خۆپارێزی لەئێمە دەکەن و خۆتان خۆپارێز نین. سوێند بەخوا چیتر کەس داوای خۆپارێزی و خوا پەرستی لەمن ناکات مەگەر ئەوەی بیکوژم. دواتر تەختی وتاردانی بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا عرباز کوڕی ساریەی سولەمی (لەهاوەڵانی صوفە) مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەشام و لەکاتی ئاژاوەی کوڕی زوبەیر مرد. هەروەها لەم ساڵەدا ئەسوەد کوڕی یەزیدی ئەخەعی برازای عەلقەمە کوڕی قەیس مرد.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی حەوتەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٠

# پێرست

# پێشەکی

ساڵێك بەر لەئێستا و لە کۆتایی ئەو پێشەکییەی بۆ یەکەمین بەرگی وەرگێڕاوی کتێبی (تەواوی مێژو/ الکامل فی التاریخ)ی (عیزەدین ئیبن ئەسیر)ی مێژوو نوسی بەناوبانگی جیهانی ئیسلاممان نوسیبوو، هیوای ئەوەمان خواستبو کە برای وەرگێڕ، کاکە (زاهیر محەممەد رەشید) بەهەمان گوڕ و تینەوە بۆ تەواو کردنی ئەو کارە بایەخدارەی دەستپێکردوە، تێبکوشێت و تا وەرگێڕانی دوا بەرگی ئەم کتێبە بەنرخە بەردەوام بێت. جێگەی خۆشحاڵییە کە ئەو ئەمامەی ساڵێك بەر لە ئێستا نێژرا، سەوز بووە و چرۆی کردوە و بەخێراییەکەی چاوەڕێنەکراو بەرەو ئەوە دەڕوات گوڵی هیوامان بگەشێتەوە و بێتەبەر.

خوێنەری بەرێز، وا بەهەوڵ و کۆششی برای وەرگێر، شەش بەرگ لە(تەواوی مێژوو)تان خرایە بەردەست و ئەمەی بەردەستیشتان حەوتەمین بەرگییەتی. وەك پێشتریش لەو بڕوایەدابوم و ئەمێستایش بڕوام وایە کە ئەم کارە بایەخێکی فرە گرنگی بۆ کتێبخانەی کوردیی و بایەخپێدەرانی مێژووی ئیسلام و جیهانی ئیسلامیی هەیە، چونکە گەر بەوردیی بڕوانینە نێوەرۆکی ئەو شەش بەرگەی لە(تەواوی مێژوو) پێشتر چاپ و بلاّو کراونەتەوە ئەوا ئەو راستیەمان بەتەواویی لا دەچەسپێت کە (تەواوی مێژوو) چ گەنجینەیەکی پڕ بەهایی مێژووییە و چەندە زانیاریی ورد و گرنگی مێژوویی سەبارەت بە رووداوەکانی پێشووی دەسەلاّتە جۆراوجۆرەکان و ململانێکان و جەنگ و جولاّنەوە جیاوازەکان و وێنا کردنی ژیانی رامیاریی و ئابوریی و کۆمەلاّیەتیی جیهانی ئیسلامی گرتۆتەخۆ. هەربۆیە زێدەڕۆیی ناکەین گەر بلێین: هیچ بایەخدارێك ناتوانێت بێ خوێندنەوەیەکی ورد و تێگەیشتن لەنێوەرۆکی (تەواوی مێژوو) سەرنجێکی رۆشنی سەبارەت بەرابردووی مێژووی ناوچەکە و جیهانی ئیسلامی هەبێت. هەر لێرەیشەوەیە بایەخی ئەم وەرگێڕانە و پێویستیی تەواو کردنی کارەکە بۆ خوێنەرانی ئازیزی کورد دەردەکەوێت.

لەپاش بلاّو کردنەوەی شەش بەرگ لە(تەواوی مێژوو) و پێشکەش کردنی بەرگی حەوتەم بۆ بەردیدەی خوێنەرانی بەرێز، جارێکی دیکە دوبارەی دەکەینەوە کە

خوێنەران و بایەخداران هەر سەرنج و تێبینیەکیان سەبارەت بەتێکستە وەرگێردراوەکەوە هەیە دەتوانن بەنووسین یان هەر شێوەیەکی دیکە بێت، پێشکەشی بکەن تا برای وەرگێڕ کەم و زۆر سوودیان لێ ببینێت. لەگەڵ ئومێدی تاندروستی و سەرفەرازی بۆ هەموان.

پرۆفیسۆری یاریدەدەر

دکتۆر یاسین سەردەشتی

١٠/٢/ ٢٠٠٩

## ڕوداوەکانی ساڵی حەفتا و شەشی کۆچی ( ٦٩٥ زایینی )

## بزوتنەوەی ساڵح کوڕی موسەرەح

کوڕی ساڵح کوڕی موسەرەحی تەمیمی پیاوێکی خۆپارێز و خواپەرەست و ڕووزەرد بو کە بەردەوام پەرەستشی خوای دەکرد. لەدارا، موسڵ و جەزیرە ژیانی بەسەر دەبرد. چەندین کەس وەك هاوڕێ لەدەوری کۆدەبونەوە و قسەی بۆ دەکردن. ئەوانی بۆ بزوتنەوە لەبەرابەر ستەم و شەڕ لەگەڵ ناسازگارانی خۆی هاندا. وەڵامیان دایەوە و ئەو هاوڕێیانی خۆی بۆ شەڕ دژی ئومەوییەکان هەڵخراند. پەیك و پەیامی بۆ هاوەڵانی خۆی ڕەوانە کرد و وەڵامیان دایەوە و لەسەر ئەو بنەمایە، چاویان بەیەك کەوت. سەرقاڵی ئەم کارە بون کە نامەی شەبیبی پێگەیشت کە دەیوت: ئەگەر دەتەوێت بزوتنەوەکەی خۆت دەستپێبکەیت، ئەمە تایبەتە بەتۆ چونکە ئێمە ئەمڕۆ ڕێبەر وپیرێکی موسوڵمان و کەسێکی ڕێزدارتر لەتۆ ناناسین. ئەگەر دەتەوێت ئەو کارە دوابخەیت، منی لێ ئاگادار بکەرەوە چونکە سەرەتاکانی مەرگ شەو و ڕۆژ هێرش دەکاتە سەرخەڵکان و لەوە ئاسودە نیم کە مەرگی لەناکاو نەمگرێتەوە و شەڕم لەگەڵ ستەمکاران نەکردبێت.

ساڵح لەوەڵامدا نوسی: هیچ شتێك نەبوە بەربەستی بزوتنەوەکەم مەگەر ئەوەی چاوەڕوانی هاتنی تۆم دەکرد. بەرەو لای ئێمە ڕەوانە ببە چونکە نیازمان بەئەندێشەی کەسانێکی وەك تۆ دەبێت و ناتوانین بێ ڕاوێژ کردن بەتۆ کاروبارەکان هەڵسوڕێنین. کاتێك شەبیب نامەکەی خوێندەوە، چەند کەسێك لەیارانی خۆی بانگ کرد و لەناو ئەوان: مەصاد کوڕی نەعیمی شەیبانی، موحەلیل کوڕی وایلی یەشکری و کەسانیتر. ئەوانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و لەدارا لای ساڵح دابەزی. کاتێك ئەوی بینی، وتی: خوا ڕێزت لێ بگرێت، ئێمە بۆ شەڕی ئەم ستەمکارانە ڕەواە بکە چونکە شێوەی پێغەمبەر(د.خ) بەرەو نەمان دەڕوات و ستەمکاران یاخیگەری دەکەنە پیشە.

ساڵح بانگەوازەکەی خۆی لەهەمو شوێنێکدا بڵاوکردەوە و لەسەر ئەمە بنەمایە بەڵێنی بەواندا کە ڕۆژی یەکەمی صەفەری ساڵی ٧٦/ ٢٢ مەی ٦٩٥ بزوتنەوەکەی خۆیان دەست پێبکەن. ئەوان ئەو شەوە لای ئەو کۆبونەوە. یەکێك لەئەوان پرسی: سەرەتا پێشنیاری ئایینەکەی خۆمانیان پێبکەین یا نە؟ وتی: ئەو کارە دەکەین، چونکە ئەم کارە

جەخت لەبۆچونەکەی ئێمە دەکاتەوە. پیاوەکە پرسی: چی دەڵێیت سەبارەت بەو کەسانەی شەڕ لەگەڵ ئێمە دەکەن و ئێمە بەبەسەر ئەواندا سەرکەوتن بەدەست دێنین، ئایا خوێن و سامانی ئەوان بۆ ئێمە ڕەوایە؟ وتی: ئەگەر خوێنیان بڕێژین و سامانەکانیان تالآن بکەین، نۆشی گیانمان بێت و ئەگەر بیانبەخشین، ئەمە چاکەکاری ئێمە دەسەلمێنێت.

دواتر ئامۆژگاری یارانی خۆی کرد و فەرمانەکانی خۆیان بەوان گەیاند و پێی وتن: زۆرینەی ئێوە پیادەکانن و چوارپێکان تایبەتن بە محەممەد کوڕی مەروان. لەوانەوە دەست پێبکەن و سەرەتا هێرش بکەنە سەر ئەوان و بەبەدەستهێنانی چوارپێکان هێزی خۆتان پەرەپێبدەن.

ئەوان لەو شەوەدا هاتن و چوارپێکانیان گرت و سواری بون و بۆ ماوەی سیانزە شەو لەسەرزەمینی دارا مانەوە. خەڵکی ئەم شارە و خەڵکانی نەصیبین و سنجار خۆیان لەناو قەلآکاندا داشارد. ئەو لەگەڵ سەد وبیست یا سەد و دە پیاوی شەڕکەر بزوتنەوەکەی خۆی دەست پێکرد.

هەواڵی بزوتنەوەکەی ئەوان بەمحەممەد کوڕی مەروان گەیشت. ئەو فەرمانداری جەزیرە بو. عەدی کوڕی عەدی کێندی لەگەڵ هەزار سوار بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەو لەحەرانەوە بەڕێکەوت و لەدوغان دابەزی. ئەمانە یەکەم دەستەی ئەو سوپایەبون کە ڕوبەڕوی ساڵح کوڕی موسەرەح بونەوە. عەدی بەشێوەیەکی ترساو بەڕێکەوت وەك بڵێی بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێت. ئەو پەیامی بۆ ساڵح ڕەوانە کرد کە لەشەڕ کردن لەگەڵ تۆ بێزارم و خوازیارم لەم شارە کۆچ بکەیت. عەدی پیاوێکی خواپەرەست بو. ساڵح وەڵامی دایەوە: ئەگەر باوەڕت بەباوەڕەکەی ئێمە هەیە، لەبەرابەر تۆ پاشەکشێ دەکەین و گەرنە لەناو خۆماندا ڕاوێژ دەکەین بۆ ئەوەی چ کارێك ئەنجام بدەین. عەدی پەیامی بۆ نارد کە: باوەڕم بەباوەڕەکەی تۆ نیە بەڵام لە شەڕ لەگەڵ تۆ یا هەر کەسێکیتر بێزارم. بەیارانی خۆی وت: سوار بن. ئەوان سوار بون. نێردراوەکەی لای خۆی زیندانی کرد و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بەڕێکەوت و هێرشی کردە سەر سوپاکەی عەدی کە بۆ نوێژی نیمەڕۆ ڕیزیان بەستبو. نەکەوتبونە خۆ سوارەکانی لەسەر سەری خۆی بینی. کاتێك ئەوانیان بینی، یەکتریان بانگ کرد. ساڵح

شەبیبی کردە فەرمانەدەی باڵی ڕاستی سوپاکەی و سوەید کوڕی سەلیمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ. خۆی لەناو دڵی سوپاکەیدا مایەوە. هێرشیکردە سەرئەوان کە هێشتا نەیانتوانیبو بۆ شەڕ خۆیان ئامادە بکەن و لەناو ڕیزەکانی یەك هاتوچۆیان دەکرد. شەبیب و سوەید هێرشیان کردە سەرئەوان کە شکستیان خوارد و هەلاتن. ئەسپەکەیان بۆعەدی هێنا کە سواری بوو و هەلات. ساڵح کوڕی موسەرەح گەیشت و ئەوەی لەناو لەشکرگەکەی ئەو دەستی کەوت، هەڵیگرت و تالآنی کرد.

هاوەلآنی عەدی کوڕی عەدی ڕۆشتنە لای محەممەد کوڕی مەروان. ئەو لەعەدی توڕە و خالید کوڕی جەزءی سەلەمی هاوڕێ لەگەڵ هەزار و پێنسەد شەڕکەر ڕەوانە کرد. حارس کوڕی جەعونەی عامری بانگ کرد و ئەویشی لەگەڵ پێنسەد شەڕکەر ڕەوانە کرد. بەو دوانەی وت: هێرش بکەنە سەر ئەم هەلگەڕاوە لەدین و بەخێرایی بەرێکەون. هەر کام پێشتر بگات، فەرمانەدەی هاورێکەی خۆی بێت. ئەو دوانە یەك لەدوای یەك ڕۆشتنەدەر و بەردەوام پرسیاری ساڵح کوڕی موسەرەحیان دەکرد. بەوان وترا: بەرەو ئامەد (دیاربەکر) ڕۆیشتوە. ئەم دوانە مەبەستی ئەویان کرد. ساڵح شەبیبی هاورێ لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەلآنی خۆی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی حارس کوڕی جەعونە ڕەوانە کرد و خۆی لەگەڵ کەسانیتر مەبەستی ڕوبەڕوبونەوەی لەگەڵ خالید کوڕی جەزءی سەلەمی کرد. لەکاتی نوێژی نیمەڕۆ دژوارترین شەڕیان دەست پێکرد. سوارەکانی محەممەد کوڕی مەروان نەیانتوانی لەبەرابەر سوارەکانی ساڵح خۆڕاگری بکەن. کاتێك دو فەرماندەکە ئەمەیان بینی، دابەزین و زۆرینەی سوپاکەیان دابەزی. لەم کاتەدا سوپاکەی ساڵح نەیانتوانی بەسەر ئەواندا سەرکەون. کاتێك هێرشیان دەکردە سەریان، پیادەکان بەرم پێشوازیان لێدەکردن و تیرهاوێژەکان تیربارانیان دەکردن و سوارەکان شوێنیان دەکەوتن. شەڕ تا شەو درێژەی کێشا. برینداروەکان لەهەردولا فراوان بون. لەسوپاکەی ساڵح نزیکەی سی کەس کوژرا و لەسوپاکەی محەممەد زیاتر لەحەفتا کەس.

کاتێك شەو داهات، هەردولا بۆ لەشکرگەکانی خۆیان گەڕانەوە. ساڵح لەگەڵ هاوەلآنی خۆی ڕاوێژی کرد. شەبیب وتی: ئەم خەڵکە پشتیان بەسەنگەرەکانی خۆیان بەستوە و بۆچونی من وایە نەمێنینەوە. ساڵح وتی: منیش ئەوە بەباش دەزانم. هەمان شەو ئەو پانتاییەیان چۆڵ کرد و سەرزەمینی موسڵ و جەزیرەیان بڕی و گەیشتنە دەسکەرە.

کاتێك حەجاج ئەمەی بیست، حارس کوڕی عومەیرە کوڕی زی ئەلشعاری هاوڕێ لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر لەخەڵکانی کوفە رەوانە کرد. ئەو بەرێکەوت تاگەیشتە دەسکەرە. ساڵح کوڕی موسەرەح هاتەدەر و تا گوندێك بەناوی مەدبەج لەسنورەکانی نێوان جوخی و موسلج رۆشتە پێش. ساڵح نەوەد پیاوی شەڕکەر هاورێیەتیان دەکرد. حارس کوڕی عومەیرە سیانزە رۆژ بۆ کۆتایی جەمادی (یەکەم یا دوەم؟!) روبەروی ئەوان بویەوە. هەردولا شەڕیان دەست پێکرد و سوەید کوڕی سەلیم کە فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی ساڵح بو، شکستی خوارد و ساڵح بوێرانە خۆڕاگری کرد تا کوژرا. شەبیب لەشەڕکردن بەردەوام بو تا ئەوەی لەئەسپەکەی کەوتەخوار و پیادە هێرشی کردە سەر ئەوان. ئەوان پاشەکشێیان کرد. رۆشتە شوێنەکەی ساڵح و بینی کوژراوە. هاواری کرد: ئەی موسوڵمانەکان، لەدەوری من کۆببنەوە. ئەوان کۆبونەوە. بەهاوەڵانی خۆی وت: ئێوە دوکەس دو کەس پشت بەپشتی یەکەوە بنێن و بەرم لەدوژمن بدەن تا برۆینە ناو ئەو قەڵایە و لەبارودۆخ بکۆڵینەوە. ئەو کارەیان کرد و هەمویان رۆشتنە ناو قەڵاکە. حەفتا پیاو بون. حارس گەمارۆی خستە سەرئەوان و دەرگاکەی ئاگر تێبەردا و وتی: ئەوان ناتوانن بێنەدەر.

## بەیعەت لەگەڵ شەبیبی خارجی

## شەڕی ئەو لەگەڵ حارس کوڕی عومەیرە

کاتێك حارس دەرگاکەی بەسەر شەبیب و هاوەڵانی سوتاند، وتی: ئەوان ناتوانن بێنەدەر وئێمە بەرەبەیان هێرشیان دەکەینە سەر و کوشتاریان دەکەین. ئەو بۆ لەشکرگەکەی خۆی گەڕایەوە. شەبیب بەهاوەڵانی خۆی وت: چاوەڕوانی چی دەکەن؟ سوێند بەخوا ئەگەر ئەوان لەبەرەبەیان هێرش بکەنە سەرتان، لەناوتان دەبەن. وتیان: فەرمانی خۆت بدە. وتی: لەگەڵ من یا کەسێکیتر لەهاوەڵان بەیعەت بکەن و دەڕۆینەدەر تا لەلەشکرگەکەیان هێرشیان بکەینە سەر چونکە ئێستا ئارام و ئاسودە دەژین.

لەگەڵ شەبیب بەیعەتیان کرد. ئەو شەبیب کوڕی یەزید کوڕی نوعەیمی شەیبانی بو. ئەمەدەکانیان هێنا و تەڕیان کرد و خستیانە سەر ئاگرەکە و هاتنەدەر. حارس نەکەوتبوە خۆ کەبینی شەبیب و هاوەڵانی بەشمشێر هێرشیان کردۆتە سەریان. حارس کەوتە سەر زەوی. هاوەڵانی هەڵیان گرت وبۆ مەداین پاشەکشێیان کرد. شەبیب لەشکرگەکەی ئەوانی تاڵان کرد. ئەوە یەکەم سوپابو لەسەر دەستی شەبیب شکستی خوارد.

## شەڕ لەنێوان هاوەڵانی شەبیب و کەسانیتر

دواتر شەبیب لەسەرزەمینی موسڵ چاوی بە سەلامە کوڕی سەنانی تەمیمی (تیم شەیبان) کەوت. داوای لێکرد تا بۆ هاوکاری ئەو شەڕ بکات. سەلامە پەیمانی لێوەرگرت تا سی سوار هەڵبژێرێت و ئەوان بەرەو سەرزەمینی عەنەزە رەوانە بکات تا تۆڵەی خۆیان لەوان بکاتەوە چونکە ئەوان فەزاڵەی برایان کوشتبو. گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە بەمشێوەیە: فەزاڵە لەگەڵ هەژدە پیاو ڕۆشتەدەر و لەسەر ئاوێك بەناوی (شەجەرە) دابەزی. لەو ناوچەیە دارێکی گەورەی گەزۆی لێبو و خەڵکی عەنەزە لەدەوری ئەو دارە دابەزیبون. کاتێك فەزاڵە و هاورێکانی ئەویان بینی، وتیان: ئەوانە دەکوژین و دەیبەینە لای سەروەری خۆمان تا شتێکمان پێ ببەخشێت. خاڵەکانی ئەو لەبەنی ئەصر وتیان: بۆ کوشتنی برازاکەمان هاوکاریتان ناکەین. خەڵکانی عەنەزە ئەوانیان سەربڕی و سەرە

براوەکانیان بردە لای عەبدولمەلیك کوڕی مەروان. لەبەر ئەمە ئەوانی لە (ئەنقیا) یا (بانقیا) نیشتەجێ کرد و بەخششی بۆ دیاری کردن. ئەوان پێشتر بەخششێکی کەمیان بۆ دیاری کرابو. سەلامە برای فەزاڵە سەبارەت بەکوژرانی براکەی خۆی و هاوکاری نەکردنی خاڵەکانی وتی:

و ما خلت اخوال الفتى يسلمونه لوقع السلاح قبل ما فعلت نصر

یانی: پێش ئەوەی خەڵکانی نەصر ئەو کارە بکەن، گومانم نەدەکرد خاڵەکان دەتوانن پیاو بەدەمی تیژی شمشێر بسپێرن.

هاتنەدەرەوەی فەزاڵە پێش بزوتنەوەکەی ساڵح کوڕی موسەرەح بو. شەبیب بەداواکەی رازی بو. بەرێکەوت تا گەیشتە خەڵکی عەنەزە. ئەو گەرەك بەگەرەك کوشتاری کرد تا گەیشتە دەستەیەك لەوان کە پوری لەناویاندابو. ژنەکە منداڵەکەی خۆی لەئامێز گرتبو. ژن مەمکی دەرهێنا و وتی: ئەی سەلامە، سوێندت دەدەم بەپەیوەندی ئەم کوڕە لەگەڵ مەمکی دایکی. سەلامە وتی: لەو کاتەوەی فەزاڵە خۆی بەدارەکەوە نوساند، نەمبینیوە (فەزاڵە برای بو) سەلامە زیادی کرد: ئەی ژن، یا لەمناڵەکە دوردەکەویتەوە، یا بەرم هەردوکتان دەکوژم. ژن هەستا و ئەو مناڵەکەی کوشت.

## ڕەوانەبونی شەبیب بەرەو بەنی شەیبان و هێرش کردنە سەرئەوان

دواتر شەبیب هاورێ لەگەڵ سوارەکانی خۆی بەرەو رازان ئەسپی غاردا. دەستەیەك لەبەنی شەیبان، هاورێ لەگەڵ خەڵکانیتر هەڵاتن تا لەدێری خورەزاد لای حەولایا دابەزین. ئەوان نزیکەی سێ هەزار کەس بون. شەبیب حەفتا پیاو یا زیاتر یا کەمتر هاورێیەتیان دەکرد. بەرەو لای ئەوان ڕۆشت و ئەوان خۆیان داشارد.

دواتر شەبیب لەگەڵ دوانزە پیاو بۆ لای دایکی ڕۆشت کە لەداوێنی کێوێك بەناوی ساتێدەما ژیانی بەسەر دەبرد. وتی: بێ گومان لەگەڵ خۆم دەیهێنم تا لەناو لەشکرگەکەی مندا بێت و لەمن جیا نەبێتەوە تا دەمرێت یا دەمرم. کاتژمێرێك ئەوانی لەگەڵ خۆی برد. لەم کاتەدا دەستەیەك لەبەنی شەیبان هاورێ لەگەڵ سامانەکانیان دەرکەوتن کە لەوێ مابونەوە و گومانیان نەدەکرد شەبیب لای ئەوانەوە تێپەرێت و ئەویش ئەوانی نەدەبینی. هێرشی کردەسەر ئەوان و سی پیاوی بەتەمەنی لەوان کوشت

کە یەکێك لەوان حەوسەرە کوڕی ئەسعد بو. شەبیب ڕۆشتە لای دایکی و ئەوی هەڵگرت. پیاوێك لەسەرەوەی دێرەکە سەیری هاوەڵانی شەبیبی کرد. شەبیب براکەی خۆی موصاد کوڕی یەزیدی کردبوە فەرماندەی پیاوە شەڕکەرەکانی. ئەوان گەمارۆیان خستبوە سەر ئەو کەسانەی لەناو دێرەکەدا مابونەوە. پیاوێك لەکەسانی ناو دێر هاتەدەر و روی کردە هاوەڵانی شەبیب و وتی: ئەی خەڵکینە، ڕێگەبدەن قورئان لەنێوان ئێمەدا داوەر بێت. خوای گەورە دەفەرمێت: ئەی پێغەمبەر، ئەگەر یەکێك لەبتپەرستەکان داوای ئەمانی لەتۆ کرد، ئەمانی پێ ببەخشە تا فەرمودەکانی خوا ببیستێت. دواتر ئارامی و ئاسودەیی بیر بخەرەوە. (تۆبە/٩/٦). دەستمان لێ هەڵگرن تا ئەمان بەخشراو بێینە لای ئێوە و ئێوە لەباوەڕ و بۆچونەکانی خۆتان ئاگادارمان بکەنەوە کەئەگەر پێی رازی بوین خوێن و سامانی ئێمە بۆ ئێوە ناڕەوا بێت. ئەگەر رازی نەبوین بمانگەڕێننەوە بۆ شوێنەکەی خۆمان و دواتر بزانن دەتانەوێت چی لەگەڵ ئێمە بکەن. ئەوان وەڵامیان دانەوە و رازی بون. ڕۆشتنە لای ئەوان. هاوەڵانی شەبیب باوەڕەکانی خۆیان پێ پێشنیار کردن کە هەمویان رازی بون و دواتر لای ئەوان دابەزین. شەبیب گەڕایەوە و ئەوان ئاگاداریان کردەوە و وتی: راستی و دروستیتان کردە پیشە و بەختەوەر بون.

## شەڕی نێوان شەبیب و سوفیانی خەسعەمی

شەبیب ئەو سەرزەمینەی بەجێهێشت. دەستەیەك لەگەڵ ئەو کۆچیان کرد و دەستەیەك مانەوە. شەبیب سەرزەمینی موسڵی بڕی و بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوت. حەجاج نامەی بۆ سوفیان کوڕی ئەبی ئەلعالیەی خەسعەمی نارد و فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە. ئەو فەرماندەیی هەزار پیاوی شەڕکەری لەئەستۆدابو. حەجاج دەیویست رەوانەی تەبەرستانی بکات. کاتێك نامەکەی حەجاجی پێگەیشت، لەگەڵ پاشای تەبەرستان پەیمان نامەی ئاشتی مۆر کرد و گەڕایەوە. حەجاج فەرمانی پێدا لەدەسکەرە دابەزێت تا سوپاکەی حارس کوڕی عومەیرەی هەمەدانی (بکوژەکەی ساڵح کوڕی موسەرەح) پەیوەستی ببێت و سوارەکانی (مونازێر) بگەنە لای و دواتر بۆ شەڕی شەبیب رەوانە ببێت. ئەو لە دەسکەرە مایەوە. لەناو سوپاکەی حارس جاڕیاندا: شەڕ لەمەداین و کوفەیە. بەرێکەوتن تا گەیشتنە سوفیان و سوارەکانی مونازێر پەیوەستی بون. فەرماندەی ئەم سوارکارانە سورە کوڕی حوڕی تەمیمی بو. سورە نامەی بۆ نوسی

کەچاوەڕوان بێت تا پەیوەستی دەبێت. سوفیان لەگەڕان بەدوای شەبیب پەلەی کرد و ئەوی لەخانەقین دۆزیەوە. شەبیب خۆی لەوان دورخستەوە وەك بڵێی دەیویست بڵێت شەڕکردن لەگەڵ ئەوانی پێ خۆش نیە. براکەی خۆی موصاد کوڕی یەزیدی هاوڕێ لەگەڵ پەنجا سوار رەوانەی زەویەکی تەخت و ئارام کرد و خۆی ڕۆشتە سەر لوتکەی کێوەکە. وتیان: دوژمنی خوا هەڵات. پەلە مەکەن تا ئەم سەرزەمینە بگەڕێین، ئەگەری هەیە کەسانێکی بۆ زیان گەیاندن بەئێمە لەسەر ڕێگاکە دانابێت.

ئەوان گوێیان لەوتارەکەی نەگرت و شوێنی کەوتن. کاتێك لەبۆسەکەی یەزید تێپەڕیان کرد، شەبیب لەسەرەوە هێرشی کرد و یەزید لەپشت سەریانەوە. خەڵك بێ شەڕ کردن شکستیان خوارد و هەڵاتن. سوفیان لەگەڵ دوسەد شەڕکەر خۆڕاگری کرد و بوێرانە شەڕی لەگەڵ کردن. سوەید کوڕی سەلیم بەڕم هێرشی کردە سەر سوفیان و ئەوسا هەردوکیان شمشێریان لەکاڵان دەرکێشا و شەڕیان کرد. دواتر زۆرانیان تاقی کردەوە. هەردوکیان کەوتنە سەرزەوی. هەردولای شەڕکەر لەیەك جیابونەوە و شەبیب هێرشی کردەسەریان کە پاشەکشێیان کرد. کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی سوفیان فریایی کەوت و بەرگری لێکرد. دواتر خۆی دابەزی و سوفیانی سوار ئەسپ کرد و شەڕی دەست پێکرد. کۆیلە کوژرا و سوفیان رزگاری بو. بەرێکەوت و خۆی گەیاندە بابلی مێهرود. نامەی بۆ حەجاج نوسی و ئاگاداری کردەوە کە خەڵکان بۆ هاوکاری کردنی هاتون بەڵام سورە کوڕی حوڕ هێشتا پەیوەستی نەبوە. کاتێك حەجاج نامەکەی خوێندەوە، دەستخۆشی لێکرد.

## شەڕی نێوان سورە کوڕی حوڕ و شەبیب

کاتێك نامەکەی سوفیان بەحەجاج گەیشت، نامەی بۆ سورە کوڕی حوڕ نوسی و سەرکۆنەی کرد و ئاگاداری کردەوە و فەرمانی پێدا پێنسەد سوار لەمەداین هەڵبژێرێت و هاوڕێ لەگەڵ ئەوان بۆ شەڕی شەبیب رەوانە ببێت. سورە ئەو کارەی کرد و بەرێکەوت. شەبیب لەجوخی دەسوڕایەوە و سورە بەدوایەوە بو. شەبیب گەشتە مەداین و خەڵك لەترسی ئەو خۆیان داشارد. لەوێ چوارپێکانی هەڵگرت و هەرکەسێك لەبەرابەری خۆڕاگری کرد، کوژرا. پێیان وت: سورە گەیشتوە. بەرێکەوت تا گەیشتە نەهرەوان. ئەوان نوێژیان لەسەر هاورێکانی خۆیان خوێند کە لەسەر دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

کوژرابون و داوای بەخششی خواییان بۆ کردن و بێزاری خۆیان لەعەلی و سوپاکەی دەربڕی. سیخوڕەکانی سورە لەشوێنی شەبیب ئاگاداریان کردەوە. هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و وتی: سوارەکانی شەبیب لەسەد کەس تێناپەڕن. بڕیارمداوە لەناو ئێوەدا سێسەد کەس هەڵبژێرم و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوم و لەکاتێکی نائاگا هێرش بکەمەسەری چونکە چاوەڕوانم خوا لەناویان ببات. ئەوان ڕازی بون. ئەو سێسەد شەرکەری بەهێزی هەڵبژارد وبەرەو نەهرەوان بەرێکەوت. شەبیب شەوی کردە ڕۆژ و لەهەمو شوێنێك پاسەوانی دانا و ئالآی ئامادەبون بۆ شەڕی هەڵکرد. کاتێك هاوەڵانی سورە نزیك کەوتنەوە، سوارەکانی شەبیب ئاگادار بونەوە و سوار ئەسپەکانی خۆیان بون و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. کاتێك سورە گەیشتە ئەوان، بینی بۆ شەڕ ئامادە و تەیارن. هێرشی کردە سەر ئەوان. خۆڕاگریان کرد. شەبیب هاواری لەسوارەکانی خۆی کرد کە هێرشیان کردە سەر سورە و گۆڕەپانی شەڕیان لەوان پاك کردەوە. شەبیب بەردەوام دەیوت:

من ينك العير ينك نياكا جندلتان اصطكتا اصطكاكا

یانی: کەسێ کە کەرێکی نێر بگێت، گانکەرێکی تێکۆشەری گاوە، دو تاشەبەردی گەورەن کە بەتوندی بەریەك کەوتون.

سورە بۆ لەشکرگەکەی خۆی گەڕایەوە و بینی سوارەکان و پیاوە بەهێزەکانی شکستیان خواردەوە. ئەوانی هەڵگرت و ڕوی لەمەداین کرد و شەبیب شوێن پێی هەڵگرت بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە و سوپاکەی لەناو ببات. کاتێك گەیشتە ئەوان کە گەشتبونە ناو مەداین. کوڕی ئەبی عوصفیر فەرمانداری مەداین لەگەڵ خەڵکانی مەداین هاتەدەر. ئەوان سوپاکەی شەبیبیان بەردباران و تیرباران کرد. شەبیب لەمەداین پاشەکشێی کرد و لای گولوازی تێپەڕی و لەوێ چوارپێکانی تایبەت بەحەجاجی هەڵگرت و لەگەڵ خۆی بردی بۆ تکریت. بەگەشتنی شەبیب بۆ مەداین، خەڵکەکەی ترسان و تۆقان و سوپاییەکان بۆ کوفە ڕایان کرد. شەبیب لەتکریت بو. حەجاج سەرکۆنەی سورەی کرد و خستیە زیندان و دواتر ئازادی کرد.

## شەڕ لەنێوان شەبیب و جەزل کوڕی سەعید کوژرانی سەعید کوڕی موجادل

کاتێك هەڵاتوان گەیشتنە کوفە، حەجاج بۆ شەڕ لەگەڵ شەبیب، جەزل کوڕی سەعید کوڕی شورەحبیلی کێندی رەوانە کرد کەناوی عوسمان بو. فەرمانی پێدا وشیار وبۆ شەڕ ئامادە بێت و لەپەلە کردن خۆی بەدور بگرێت. ئەو بەحەجاجی وت: لەشەڕکەرە شکست خواردوەکان کەس مەکەرە هاورێی من چونکە ترس دڵی ئەوانی پڕکردوە و موسوڵمانان هیچ سودێکیان لەوان پێنابڕێت. وتی: راست دەکەیت. هاورێ لەگەڵ ئەو چوارهەزار پیاوی شەڕکەری رەوانە کرد. ئەوان لەگەڵ جەزل بەرێکەوتن. جەزل، عەیاز کوڕی ئەبی لوبنەی کێندی وەك پێشەنگی خۆی رەوانە کرد. ئەوان بەدوای شەبیبدا گەڕان. شەبیب بەشێوەیەك هەڵس و کەوتی دەکرد وەك بڵێی شکۆ و گەورەییەکەی تایبەتی پێبڕاوە. لەگوندێك دەڕۆشتە گوندێکیتر و لەهیچ شوێنێك نەدەمایەوە لەترسی ئەوەی نەکا جەزل بڵاوە بەهاورێکانی بکات. بەردەوام کاتێك هێرشی دەکردە سەر جەزل، کە بۆ شەڕ ئامادە نەبو. لەبەر ئەمە جەزل بەردەوام لەبارودۆخی ئامادەیی بۆ شەڕ رێگای دەبڕی. لەهەر شوێنێك دادەبەزی، سەنگەری هەڵدەکەند.

کاتێك ئەم کارە خایاندی، شەبیب سوپاکەی خۆی کۆکردەوە کە ئێستا نزیکەی سەد و شەست پیاوی شەڕکەر بون. ئەوانی بۆ چوار دەستە دابەش کرد: براکەی موصادی کردە فەرمانده‌ی چل پیاوی شەڕکەر و سوەید کوڕی سەلیم فەرماندەی چل شەڕکەری تر و موحەلیل کوڕی وایل فەرماندەی چل شەڕکەر. خۆی لەگەڵ چل پیاوی شەڕکەر مایەوە. ئاگاداریان کردەوە کە جەزل لەدێری یەزدگێردە. شەبیب فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا و سوار چوارپێکان بون. دواتر لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و فەرمانی بەهەرکام لەفەرماندەکان دا لەو گوندەوەی بۆی دیاریکردبو، هێرش بکاتە سەر جەزل. وتی: دەمەوێت بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەمەسەری. فەرمانی پێدان بوێرانە شەڕ بکەن و ئازایانە روبەروی ببنەوە. براکەی بەرێکەوت و گەیشتە دێری خوراره. بینی کە جەزل هاورێ لەگەڵ کوڕی ئەبی لوبنە پێگەیەکیان دروست کردوە. موصاد هاورێ لەگەڵ چل پیاوی شەڕکەر هێرشی کردە سەرئەوان. ماوەیەك خۆڕاگری و دواتر پاشەکشێیان کرد. شەبیب هات و هێرشی کرد. وتی: کەڵێن لەناو لەشکرگەکەیان دروست بکەن و ئەگەر

توانیتان بەسەریاندا سەرکەون. بەشێوەیەکی خۆڕاگرانە شوێنیان کەوتن تا گەشتنە ناو لەشکرگەکەیان. سوپاکەی ئەو ڕێگریان لەهاتنی ئەوان بۆ ناو لەشکرگەکەیان گرت و ڕێگەیان نەدا بگەنە ناو سەنگەرەکان. جەزل چەندین پێگەی دیکەی ئامادە کردبو. شەڕکەرانی ئەم شوێنانە گەیشتن و بونە بەربەست لەگەیشتنی خەواریج بۆ ناو سەنگەرەکان. جەزل بەسوپاکەی خۆی وت: بەتیرباران کردنی دوژمن بەرگری لەخۆتان بکەن. شەبیب ئەوەندە هێرشی کردە سەر پێگەکانی ئەوان کە ناچاری کردن پەنا بۆ سەنگەرەکانیان ببەن. سوپاییەکان ئەوانیان تیرباران کرد. کاتێك شەبیب بینی ناتوانێت خۆی بەجەزل بگەیێنێت، بەهاوەڵانی خۆی وت: درێژەی بەرێگەی خۆتان بدەن و دەستبەرداری ئەوان ببن. ئەو ڕێگەی خۆی گرتەبەر و دواتر هاوەڵانی دابەزین تا کەمێك بحەوێنەوە. دوبارە بۆ جاری دوەم بەئامادەیی تەواو بۆ شەڕ گەڕایەوە و بەهاوەڵانی خۆی وت: بەدەوری لەشکرگەکە بسوڕێنەوە. بینیان سوپاکەی جەزل بەتەواوەتی پاسەوانی و پارێزگاری لەپێگەکانی خۆیان دەکەن و ئاسودە بون. بەڵام نەکەوتبونە خۆ کە لەناکاو دەنگی سمی ئەسپیەکانیان بیست: هاوەڵانی شەبیب پێش بەرەبەیان لەوان نزیك بونەوە و لەچوارلاوە گەمارۆیان خستە سەریان. شەڕیان لەگەڵ سوپاکەی شەبیب کرد.

شەبیب بۆ براکەی کە لەقۆڵی کوفەوە شەڕی لەگەڵ ئەوان دەکرد، پەیامی نارد کە بەرەو لای ئێمە وەرە و ڕێگەیان بۆ بکەرەوە. ئەو کارەی کرد. ئەوان لەسێ قۆڵەوە شەڕیان لەگەڵ سوپاکەی جەزل کرد. شەڕ تا هەڵاتنی خۆر بەردەوام بو. شەبیب بەرێکەوت و ئەوانی بەجێهێشت بەڵام بەسەر ئەواندا سەرنەکەوت. لەشوێنێك بەدوری یەك میل و نیو لەوان دابەزی. نوێژی بەیانی خوێند و بەرەو جەرجەرایا بەرێکەوت.

جەزل بەئامادەیی تەواو بۆ شەڕ شوێنیان کەوت و تەنیا لەناو سەنگەرەکان شەڕی کرد. شەبیب لەسەرزەمینی جوخی و سەرزەمینەکانیتر گەڕا و باجی کۆدەکردەوە. ئەم کارە بۆ حەجاج گران و دژوار بو. نامەی بۆ جەزل نوسی و سەرکۆنەی سستی ئەوی کرد و فەرمانی پێدا لەشوێن کەوتنی ئەوان زیاتر هەوڵ بدات. جەزل بەشێوەیەکی سەرسەختانە شوێن پێی ئەوانی هەڵگرت. حەجاج، سەعید کوڕی موجالدی وەك فەرماندەی سوپاکەی جەزل ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا بۆ شەڕ لەگەڵ شەبیب هەوڵ بدات و سستی پشت گوێ بخات.

سەعید پەیوەستی جەزل بو کە لەنەهرەوان و بەدەوری خۆی سەنگەری هەڵکەندبو. لەناو سوپاکە وتارێکی پێشکەش کرد و ئەوانی سەرکۆنە و بەکەسانێکی سست و لاواز وەسفی کردن. دواتر هاتەدەر و ئەسپەکانی سوپای پەیوەستی شەڕکەرەکانی خۆی کرد تا بەهێزی ئەوان هێرش بکاتە سەر شەبیب وکەسانیتر لەشوێنەکانیان بەجێبێڵێت. جەزل پێی وت: مەبەستی چ کارێکت کردوە؟ وتی: دەمەوێت بەهاوکاری ئەم سوارکارانە هێرش بکەمە سەر شەبیب. جەزل پێی وت: لەناو خەڵکان بەسوارە و پیادەوە بمێنەرەوە و ئەوانیان نیشان بدە چونکە سوێند بەخوا بەسەر تۆدا سەردەکەون. بڵاوە بەسوپاکەی خۆت مەکە. سەعید وتی: تۆ لەناو ریزەکاندا بمێنەرەوە. جەزل وتی: ئەی سەعید، من لەگەڵ بۆچونەکەی تۆدانیم، من لەکارەکەی تۆ بێزارم.

جەزل بۆ شەڕ خۆی ئامادە کرد و خەڵکانی کوفە ریزیان بەست. ئەوانی لەناو سەنگەرەکان هێنابویەدەر. سەعید کوڕی موجالد پێشڕەوی دەست پێکرد و خەڵك هاورێیەتیان دەکرد. شەبیب بەرەو قتیتا بەرێکەوت و لەوێ دابەزی. فەرمانی بەدێداری ئەو ناوچەدا خواردنیان بۆ ئامادە بکات. دێدار ئەو کارەی کرد و شەبیب دەروازەکانی قتیتای بەست. لەنانی نیمەڕۆ تەواو نەببون کە سەعید و سوپاکەی گەیشتن. دێدار هات و شەبیبی لەهاتنی ئەوان ئاگادار کردەوە. شەبیب وتی: ترسمان نیە، خواردنەکە بێنە. دێدارە خواردنەکەی برد. شەبیب نانی خوارد و دەستی شۆرد و دو رەکعەت نوێژی خوێند و سوار ئێسترەکەی خۆی بو و هاتەدەر. شەبیب هێرشی کردە سەر ئەوان و وتی: فەرمانڕەوایی تایبەتە بەداوەری دادپەروەر. من باوکی مودەلیلم. ئەگەر دەتانەوێت، خۆڕاگری بکەن.

شەعید بەردەوام دەیوت: ئەوان بەئەندازەی سەری مەڕێك ناتوانن خۆڕاگری بکەن. ئەو سوارەکانی خۆی کۆکردەوە و بەدوای شەبیبدا رەوانەی کردن. کاتێك شەبیب بەربڵاوی ئەوانی بینی، سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و وتی: لەکەنارەکانەوە هێرش بکەنە سەرئەوان چونکە سوێند بەخوا یا من فەرماندەکەی ئەوان دەکوژم یا ئەو من دەکوژێت. لەکەنارەکانەوە هێرشیان برد و ئەوانیان تێکشکاند.

سەعید خۆڕاگری کرد و بانگی هاوەڵانی خۆی کرد. شەبیب بەشمشێری دەرکێشراو هێرشی کردەسەر و کوشتی. ئەو سوپا گەورەیە شکستی خوارد و بەسەختی کوشتار کران

و هەڵاتن تا پەیوەستی جەزل بون. جەزل بەخەڵکانی وت: لای من کۆببنەوە! شەڕی کرد تا ئەوەی بەبریینداری لەناو کوژراوەکان هێنایانەدەر. جەزل هەواڵی ئەم شەڕەی بۆ حەجاج نوسی وئەوی لەکوژرانی سەعید ئاگادار کردەوە. ئەو لەمەداین مایەوە. حەجاج نامەی بۆ نوسی و وەسف و دەسخۆشی لێکرد. ئەو حەییان کوڕی ئەبجەری(پزیشك) رەوانە کرد تا تیماری بکات. دو هەزار درەمیشی رەوانە کرد تا بۆ خەرجی خۆی بەکاری ببات. حەییان رۆشت و درەمەکانی پێ سپارد و پەرەستاری لێکرد.

شەبیب بەرەو مەداین رۆشت. زانی بەبەهێزی ئەو شارە ناتوانێت دەستی بەخەڵکەکەی بگات. لەبەر ئەمە بەرێکەوت تا گەیشتە کەرخ و لەدیجلە تێپەڕی. کەسی بۆ بازاری بەغداد رەوانە کرد و ئەوانی ئاسودە کرد. ئەو رۆژە رۆژی بازاری ئەوان بو. بیستی کە خەڵکان لێی دەترسن. هاوەڵانی ئەسپ و کەرەستە پێویستەکانی خۆیانیان کڕی.

## رەوانە بونی شەبیب بەرەو کوفە

شەبیب بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەنزیکی (حمام عمیر بن سعد) دابەزی. کاتێك حەجاج لەهاتنەکەی ئاگادار بویەوە و بەشوێنەکەی زانی، سوەید کوڕی عەبدولرەحمانی سەعدی هاورێ لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر رەوانە کرد. پێی وت: شەر لەگەڵ شەبیب بکە، ئەگەر هەڵات شوێنی مەکەوە.

ئەو رۆشت و لەسەبخە ئوردوی لێدا. ئاگاداریان کردەوە شەبیب بەرەو لای ئەم دێت. ئەویش بەرەو روی شەبیب بەرێکەوت. هاورێکانی بەرادەیەك دەترسان وەك بڵێی بەرەو مەرگ هەنگاویان دەبری. حەجاج فەرمانی بەعوسمان کوڕی قەتندا لەگەڵ خەڵکان لەسەبخە ئوردو لێبدات. سوەید بەرەو زوراره بەرێکەوت. سەرقاڵی ئامادە کردنی سوپاکەی خۆی بو کە پێیان وت: شەبیب هێرشی کرد. دابەزی و زۆرینەی سوپاکەی دابەزین. ئاگاداریان کردەوە کە شەبیب دەستبەرداری تۆ بوە و لەفورات تێپەڕیوە و مەبەستی ئەوەی کردوە لەشوێنێکیترەو بڕواتە ناو کوفە. عوسمان کوڕی قەتن و خەڵکانی سەبخەیان ئاگادار کردەوە کە شەبیب دەیەوێت هێرش بکاتە سەریان. ئەوان مەبەستی گەڕانەوە بۆ ناو کوفەیان کرد تا بەوان وترا: سوەید شوێن خەواریج کەوتوە، بەوان گەیشتوە و شەڕ لەگەڵ ئەوان دەکات. شەبیب بەهەمو هێزیەوە هێرشی کردە سەر

سوپاکەی سومید بەڵام نەیتوانی سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەست بێنێت. لەتەنیشت ماڵەکانی کوفە بەرەو حیرە بەرێکەوت و ئەمە لەکاتی ئێوارێدابو. سومید تا حیرە شوێنی کەوت. بینی شەبیب حیرەی بەجێهێشتوە و شوێن کاری خۆی کەوتوە. سومید دەستبەرداری بو و لەحیرە مایەوە و تا بەرەبەیان ئالآی زێرینی هەڵکرد. نامەی بۆ حەجاج نوسی و لەهاتنی شەبیب ئاگاداری کردەوە.

## شەڕی شەبیب لەگەڵ بیابان نشینەکان

حەجاج نامەی بۆ سومید نوسی و فەرمانی پێدا شوێن شەبیب بکەوێت. ئەو شوێنی کەوت. شەبیب بەرێکەوت تا هێرشی کردەسەر خوارەوەی فورات و چاوی بەکەسانێك لەخەڵکەکەی خۆی کەوت و لەوشکانیەوە بەرەو خەفان بەرێکەوت و هێرشی کردە سەر خەڵکانی بەنی ورسە و سیانزە کەس لەوانی کوشت. (حەنزەلە کوڕی مالك یەکێك بو لەوان). پێشڕەوی کرد تا لە لەصەف چاوی بەخزمەکانی باوکی کەوت. لەسەر ئەو ئاوە فرز کوڕی ئەسوەد (یەکێك لەبەنی سەڵت)بو. ئەو بەردەوام شەبیبی بۆ باوەڕەکانی سەرکۆنە دەکرد و دەبوە رێگر لە کارەکانی. شەبیب دەیوت: ئەگەر حەوت هەوسار (حەوت شەڕکەر)م هەبێت بێ گومان لەگەڵ فرز شەڕ دەکەم. کاتێك لەهاتنی شەبیب ئاگادار بونەوە، فرز سوار ئەسپەکەی خۆی بو و لەپشتی ماڵەکانەوە ڕۆشتەدەر و خەڵکان لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد (یا خەڵکان هەلآتن). بیابان نشینەکان لێی ترسابون. ئەو رێگەی قوتقوتانەی گرتەبەر و دواتر رویکردە کۆشکی بەنی موقاتل و ڕۆشتە ناو حەصاصە و لەوێوە رویکردە ئەنبار و بەرێکەوت تا گەیشتە دەقوقا و دواتر بەرەو خوارەوەی ئازەربایەجان ملی رێگەی گرتەبەر.

کاتێك دورکەوتەوە، حەجاج بەرەو بەسرە بەرێکەوت و عوروە کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبەی وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان کرد.خەڵك نەکەوتبونە خۆیان کە نامەی دێداری بابلی مێهرود بەعوروە کوڕی موغەیرە گەیشت کە بەوانی دەوت یەکێك لەباج کۆکەرەوەکان ئاگاداری کردۆتەوە کە شەبیب لەخانیگار دابەزیوە و مەبەستی هاتنە ناو کوفەی کردوە. عوروە نامەکەی بۆ حەجاج لەبەسرە رەوانە کرد کە پێش هاتنی شەبیب خۆی گەیاندە ئەم شارە.

## هاتنی شەبیب بۆ ناو کوفە

شەبیب ڕۆشتە ناو گوندی حەربی. وتی: شەڕێك بەرپا دەبێت کە دوژمنەکەی ئێوە لەناگرەکەیدا دەسوتێت. دواتر بەرێکەوت تا لەعەقرقوف دابەزی. سوەید کوڕی سەلیم پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، باشترە لەم گوندە ناو خراپە بۆ شوێنیکیتر بڕۆیت. شەبیب وتی: تۆ گومانی خراپت کرد! سوێند بەخوا تەنیا لێرەوە بۆ شەڕی دوژمن بەرێدەکەوم. گومانی خراپەکەی و (عقر) تایبەتە بەدوژمنەکانمان ئەگەر خوا بیەوێت.

دواتر لەوێوە بەرێکەوت تا پێش هاتنی حەجاج، بگاتە ناو کوفە. نامەکانی عوروە بەردەوام بەدەستی حەجاج دەگەیشت و لەکاتی نوێژی ئێوارێ گەیشتە ناو کوفە. شەبیب لەکاتی نوێژی شێوان لەسەبخە دابەزی. نانیان خوارد و سوار ئەسپەکانی خۆیان بون و ڕۆشتنە ناو کوفە و گەیشتنە ناو بازار. شەبیب گورزێکی لەدەرگای کۆشکدا کەدەرگاکەی شکاند. دواتر ڕۆشتە سەر بەرزاییەك و وتی:

عبد دعی من ثمود اصله        لابل یقال ابو ابیهم یقدم

یانی: کۆیلەیەکی ڕوسپی زادە کە نەژادی دەگەڕێتەوە بۆ خەڵکی سەمود. نا، بەڵکو دەوترێت باوکی باوکیان (یەقدومە).

مەبەستی حەجاج بو چونکە دەستەیەك لەخەڵکان دەیانوت: سەقەفیەکان پاشماوەکانی نەتەوەی سەمودن. دەستەیەکیتر دەیانەوت: ئەوان نەژادیان دەگەڕێتەوە بۆ یەقدومی ئەیادی.

دواتر هێرشی کردە سەر مزگەوتی شارەکە کەهێشتا هەندێ کەس نوێژیان دەخوێند. هاوەڵانی شەبیب لەمزگەوت عەقیل کوڕی موصعەبی وادعی و عودەی کوڕی عەمرۆ سەقەفی و ئەبو لەیس کوڕی ئەبی سولەیمیان کوشت. دواتر لای ماڵی حوشب تێپەڕین. ئەو فەرماندەی پاسەوانەکان بو. پێیان وت: فەرماندار (حەجاج) تۆی دەوێت. ویستی سوار ئەسپەکەی بێت بەڵام ئەوانی بەبێگانە هاتەبەرچاو و نەڕۆشتە لای ئەوان. ئەوان کۆیلەکەیان کوشت. دواتر شەبیب ڕۆشتە لای جەحاف کوڕی ئەبیتی شەیبانی و پێی وت: وەرە تا بەهای ئەو وشترە گەنجە بدەم کە لەبیابان لەتۆم کڕی. جەحاف وتی: ئەی سوەید (ئەی شەبیب؟) ئایا ئەمانەتیەکەی خۆت لەم تاریکە شەوەدا بیردێنیتەوە. تۆ سوار ئەسپەکەی خۆتیت. خوا قێزەون بکات ئەو قەرزەی تەنیا بەڕشتنی خوێنی بێ

تاوانەکان و کوشتنی هاورێیان دەدرێتەوە.

دواتر لای مزگەوتی زوهەل تێپەڕین. لەوێ زوهەل کوڕی حارسیان بینی. ئەو نوێژی درێژ دەکردەوە. سەریان بڕی. ئەوسا لەکوفە هاتنەدەر و نەزر کوڕی قەعقاع کوڕی شوری زوهەلی چاوی بەوان کەوت. نەزر وتی: سلاّو لەتۆ ئەی سەروەر. شەبیب وتی: هاوار لەتۆ، بلێ سەروەری باوەڕداران. نەزر وتی: سەروەری باوەڕداران. شەبیب وتی: ئەی نەزر داوەری و فەرمانڕەوایی تەنیا تایبەتە بەخوا. ویستی نفرینی بکات. نەزر وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە ٢/ ١٥٦). هاوەلاّنی شەبیب هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. ئەو لەگەڵ حەجاج لە بەسرەوە گەڕابویەوە بەلاّم دواکەوتبو. دایکی نەزر ناجیە کچی هانی کوڕی قەبیسەی شەیبانی بو. شەبیب ئارەزوی دەکرد نەزر رزگاری بێت.

بەرێکەوتن و بەرەو مەردەمە ملی ڕێگەیان گرتەبەر. حەجاج فەرمانی بەجارچیەکدا کە جاریدا: ئەی سوپاکەی خوا، سوار ئەسپەکانی خۆتان بن. ئەو لەسەر بانی کۆشکەکەی بو و لەبەرابەر ئەو چرایەك دەسوتا. یەکەم کەس هاتە لای ئەو، عوسمان کوڕی قەتن کوڕی عەبداللە کوڕی حوصەین زی غوصە بو. وتی: فەرماندار ئاگادار بکەنەوە کە من هاتوم. یەکێك لەکۆیلەکانی حەجاج پێی وت: لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە. خەڵك لەهەمو شوێنێکەوە کۆبونەوە.

حەجاج، بشر کوڕی غالبی ئەسەدی هاورێ لەگەڵ دوهەزار پیاوی شەڕکەر، زایدە کوڕی قودامەی سەقەفی لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر، ئەبو زورەیس موالی بەنی تەمیمی لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر، عەبدولعەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عامر و زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکی هەرکام لەگەڵ هاوەلاّنی خۆیان بۆ شەڕی شەبیب رەوانە کرد. عەبدولمەلیك کوڕی مەروان، محەممەد کوڕی موسا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیداللەی وەك فەرمانداری سیستان دەستنیشان کردبو. نامەی بۆ حەجاج نوسی و داوای لێکرد بەپەلە هاورێ لەگەڵ هەزار سوارکار بۆ سنوری فەرمانڕەوایەتیەکەی خۆی رەوانەی بکات. محەممەد کوڕی موسا مایەوە و سەرقاڵی ئامادە کردنی سوپاکەی خۆی بو و لەم کاتەدا روداوەکانی شەبیب رویاندا. حەجاج پێی وت: بۆ شەڕی شەبیب و خەواریج بەرێکەوە. شەڕ لەگەڵ ئەوان بکە تا سەرکەوتن بەدەست بێنیت و ناوبانگت بەرز ببێتەوە. دوای ئەوە بۆ سنوری

فەرمانڕەوایەتی خۆت بەرێکەوە. ئەوی لەگەڵ ئەوان رەوانە کرد. بە فەرماندەکانی وت: ئەگەر شەڕ روبدات، فەرماندەی ئێوە زایدە کوڕی قودامە بێت. فەرماندەکان بەرێکەوتن و لەخوارەوەی فورات دابەزین. شەبیب بەرێگەی ئەواندا نەڕۆشت و ناڵای بەرەو قادسیە هەڵکرد.

## شەڕی شەبیب لەگەڵ زەحر کوڕی قەیس

حەجاج دەستەیەك لەباشترین سوارکاران کە هیچ پیادەیەك لەناویاندا نەبو و ژمارەیان دەگەیشتە هەزار و هەشسەد پیاوی شەڕکەر، لەگەڵ زەحر کوڕی قەیس رەوانەی کرد و پێی وت: بەدوای شەبیبدا بڕۆ تا لەهەر شوێنێك بینیت، شەڕی لەگەڵ بکەیت مەگەر ئەوەی بەرەو ناوچەیەکی دیکە بڕوات کە دەستبەرداری دەبیت وتەنیا کاتێك شەڕی لەگەڵ دەکەیت کە هێرش بکاتە سەر تۆ یا لەشوێنێك نیشتەجێ ببێت. زەحر بەرێکەوت تا گەیشتە سەلیحین و شەبیب بەرەو لای ئەو رەوانە بو. ئەم دوانە روبەروی یەك بونەوە. شەبیب سوارەکانی خۆی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر ریزەکانی ئەوان تا گەیشتە زەحر. زەحر شەڕی کرد تا کەوتە سەرزەوی و هاورێکانی هەڵاتن چونکە گومانیان دەکرد خەواریج ئەویان کوشتوە. کاتێك بەرەبەیان بویەوە، سەرمای بو، لەشوێنەکەی هەستا و بەرێکەوت تا گەشتە گوندێك و شەوی لەوێ بەسەر برد. لەوێوە ئەویان بردەوە بۆ کوفە. سیانزە برین بەسەریەوە بو. چەند رۆژێك مایەوە و دواتر رۆشت بۆ لای حەجاج کە ئەوی لای خۆی لەسەر تەخت دانیشاند و بەکەسانی دەوروبەری وت: هەر کەس دەوێت سەیری پیاوێکی بەهەشتی بکات کەگیان بەخشە و لەناو خەڵکان بەرێگەدا دەڕوات، دەبێت سەیری ئەم پیاوە بکات.

## شەڕی فەرماندەکان ( ئەوانەی پێشتر ئاماژەمان پێدان )و کوژرانی محەممەد کوڕی موسا

کاتێك سوپاکەی زەحر شکستیان خوارد، هاورێکانی شەبیب پێیان وت: یەکێك لەسوپاکەی ئەومان شکستدا، ئێستا با بەدەستی پڕ بگەڕێینەوە. شەبیب وتی: ئەم شکستە، ورەی فەرماندەکان و ئەو سوپایەیی لەناو بردوە کە بەشوێن ئێوەدا دەگەڕێن. با هێرشیان بکەینە سەر چونکە ئەگەر ئەوانیش تێکبشکێنین، هێچ بەربەستێك بۆ گەیشتن بەحەجاج لەبەردەمدا نابێت و ئێمە بەخواستی خوا کوفە دەگرین. وتیان: گوێرایەڵی تۆین.

شەبیب بەرێکەوت و پرسیاری فەرماندەکانی دەکرد. ئاگاداریان کردەوە کە ئەوان لەشاری روباری لەچواردە فەرسەخی کوفەن. شەبیب مەبەستی ئەوانی کرد. حەجاج پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد و ئاگاداری کردنەوە کە شەبیب مەبەستی ئەوانی کردوە. بەوانی وت: فەرمانەدەی سوپاکە زایدە کوڕی قودامەیە.

شەبیب کاتێك گەیشت کەئەوان خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کردبو. فەرماندەی باڵی راستی سوپای خەڵکانی کوفە زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکی بو. فەرماندەی باڵی راست بشر کوڕی غالبی ئەسەدی و هەر فەرماندەیەك فەرماندەی سوپاکەی خۆی. شەبیب سوار لەسەر ئەسپێکی تەوێڵ سپی لەگەڵ سێ دەستەی شەڕکەر گەیشت: دەستەیەك بەسەرکردایەتی سوەید کوڕی سەلیم کە لەروبەروی باڵی راستی ئەوان وەستا، دەستەیەك بەفەرماندەیی موصاد کوڕی یەزید کە روبەروی باڵی چەپ ریزی بەست و دەستەیەك بەفەرماندەیی شەبیب کە لەبەرابەر دڵی سوپای خەڵکانی کوفە ریزی بەست.

زایدە کوڕی قودامە هاتەدەر و لەناو خەڵکدا گەڕا و ئەوانی بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمنان و خەواریج هاندا و هیوای سەرکەوتنی پێ بەخشین. لەسەر ئەو بنەمای کە خەواریج کەم و گومڕا و ئەوان لەسەر راستی و دروستی بون. دواتر گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. سوەید کوڕی سەلیم هێرشی کردە سەر زیاد کوڕی عەمرۆ کە سوپاکەی بلاوەیان لێکرد زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکی هاورێ لەگەڵ نیوەی هاوەڵانی خۆڕاگری کرد. دواتر سوەید کەمێك پاشەکشێی کرد و بۆ جاری دوەم هێرشی کردە سەریان. ماوەیەك شەڕیان کردو

زیاد خۆڕاگری کرد و سەرسەختانە شەڕی دەکرد و سومەیدیش بەنازایەتی هەرچی زیاتر شەڕی دەکرد. ئەو بەبەهێزترین پیاوی عەرەبەکان هەژمار کرا. دواتر سومەید کەمێك پاشەکشێی کرد و بینی هاوەڵانی زیاد بلاَوبونەتەوە. یارانی سومەید پێیان وت: ئایا نابینی ئەوان بلاَو بونەتەوە؟ هێرش بکەسەریان. سومەید وتی: با زیاتر بلاَوەی لێ بکەن. دواتر بۆ جاری سێیەم هێرشی کردە سەریان کە شکستیان خوارد و هەلاَتن. شمشێرەکان لەهەر لایەکەوە گەمارۆیان خستە سەر زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکی بەلاَم زیانی بەرنەکەوت چونکە زرێیەکی ئەستوری لەبەر کردبو. ئەویش هەلاَت. لەکاتی ئێوارێدا زیاد کەمێك بریندار ببو.

هێرشیان کردە سەر عەبدولعەلی کوڕی عامر و ئەویشیان تێکشکاند چونکە ئەو شەڕێکی ئەوتۆی نەکرد و پەیوەستی زیاد کوڕی عەمرۆ بو و هەردوکیان هەلاَتن. خەواریج هێرشیان برد تا ئەوەی لەکاتی شەو خۆیان بە محەممەد کوڕی موسا کوڕی تەڵحە گەیاند. شەڕیان لەگەڵ کرد و ئەو پیاوانە خۆڕاگری کرد. دواتر موصاد براکەی شەبیب هێرشی کردەسەر بشر کوڕی غالب لەباڵی چەپی سوپای خەڵکانی کوفە. بشر خۆڕاگری کرد. لەئەسپەکەی دابەزی و هاورێ لەگەڵ ئەو پەنجا کەس لەئەسپەکانیان دابەزین و شەڕیان کرد تا هەمویان کوژران و سوپاکەی ئەویش شکستی خوارد.

خەواریج هێرشیان کردە سەر ئەبو زەریس موالی بەنی تەمیم کە لەپشت سەری بشر کوڕی غالب شەڕی دەکرد. ئەویان تێکشکاند تا بۆ جێگەی ئەعیەن پاشەکشێی کرد و خەواریج ئەم دوانەیشیان تێکشکاند و ئەوان بەرەو زایدە کوڕی قودامە هەلاَتن. کاتێك گەیشتنە لای ئەو، هاواری کرد: ئەی موسوڵمانان، بەزەویەوە بلکێن، بەزەویەوە بلکێن! با لەسەر ناباوەڕی خۆیان بەرابەر بەباوەڕداری ئێوە خۆڕاگرتر نەبن. ئەو سەراسەری شەو لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد تا بەرەبەیان نزیك بویەوە.

کاتێك زایدە کوژرا، ئەبو زەریس و ئەعیەن ڕۆشتنە ناو کۆشکێکی گەورە. شەبیب بەهاوەڵانی خۆی وت: شمشێر لەسەر خەڵك هەڵبگرن وپێشنیاری بەیعەتیان پێبکەن. پێشنیاری بەیعەتیان بەخەڵك کرد و ئەوان لەکاتی هەلاَتنی خۆر بەیعەتیان کرد. یەکێك لەو کەسانەی بەیعەتی کرد، ئەبو بەردە کوڕی ئەبی موسا بو. شەبیب بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەمە کوڕی یەکێك لەدو داوەرەکەیە. هاوەڵانی مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد.

شەبیب وتی: تاوانی ئەم چیە؟ ئازادیان کرد. وەك سەروەری باوەڕداران سڵاویان لەشەبیب کرد. شەبیب ئەوانی ئازاد کرد کە بەرێگەی خۆیاندا ڕۆشتن. لەوێ مانەوە تا بەرەبەیان هەڵات و کاتێك بەیانی روخساری خۆی نیشاندا، محەممەد کوڕی موسا فەرمانی بەبانگدەرەکەی خۆیدا تا بانگ بڵێت. ئەو شکستی نەخواردبو. کاتێك شەبیب دەنگی ئەوی بیست، وتی: ئەمە چیە؟ وتیان: محەممەد کوڕی موسایە کەشکستی نەخوارد. شەبیب وتی: گومانم کرد نەزانی و خۆپەرستی بۆ ئەم کارە هانیداوە. دواتر شەبیب دابەزی و نوێژی بەیانی لەگەڵ هاوەڵانی خۆی خوێند. دوای نوێژ سوار ئەسپ بون و هێرشیان کردە سەر محەممەد. دەستەیەك لەوان هەڵاتن و دەستەیەك خۆڕاگریان کرد. محەممەد شەڕی کرد تا کوژرا. خەواریج هەمو دەسکەوتەکانی ناو لەشکرگەکەیان هەڵگرت وئەو کەسانەی لەگەڵ شەبیب بەیعەتیان کردبو، هەڵاتن. هیچ کەس لەوان لەوێ نەمایەوە.

شەبیب روی کردە کۆشکێك کەئەعیەن و ئەبو زەریس لەوێ بون. ئەوان خۆیان داشارد. ئەو رۆژە گەمارۆی خستە سەرئەوان و دواتر گەمارۆکەی هەڵگرت و بەرێگەی خۆیدا ڕۆشت. هاوەڵانی وتیان: ئێستا شاری کوفە بێ پاسەوان وبێ پەنایە، سەیری کرد وبینی هاوەڵانی بریندار بون. بەوانی وت: جگە لەوەی ئەنجامتاندا، هیچ کارێکیتر لەئەستۆی ئێوەدا نیە. لەگەڵ ئەوان بەرەو نێفەر بەرێکەوت و لای صرات تێپەڕی و گەشتە خانیگار و لەوێ مایەوە. حەجاجیان ئاگادار کردەوە کە بەرەو نێفەر ڕۆیشتوە. گومانی ئەوەی کرد بەرەو مەداین دەڕوات کەدەروازەی کوفەیە. هەرکەسێك ئەو ناوچەیە بگرێت، بەشی زۆری سواد لەدەستی ئەودا دەبێت. ئەم کارە حەجاجی ترساند. ئەو عوسمان کوڕی قەتنی وەك فەرمانداری مەداین و جوخی و ئەنبار دەستنیشان کرد و عەبدالله کوڕی ئەبی عصیفەری لەسەر کار لابرد. جەزل لەوێ بو و تیماری برینەکانی خۆی دەکرد. عوسمان پەرستاری لەو نەکرد بەهەمان شێوە کەعەبدالله دەیکرد. جەزل وتی: ئەی خوایە، بەخشش و رێزداری عەبدالله زیاد بکە و هەژاری و لاوازی عوسمان کوڕی قەتن فراوان بکە.

سەبارەت بەکوژرانی محەممەد کوڕی موسا ئاماژەیان بەگێرانەوەی دیکەیش داوە. ئەوەی ئاماژەی پێدراوە ئەوەیە کە محەممەد کوڕی موسا لەگەڵ عومەر کوڕی

عوبەیداللەی مەعمەر لەشەڕی ئەبو فەدیك ئامادەبو. ئەو پیاوێكی بوێر و ئازا بو. عومەر كچەكەی كردە هاوسەری ئەو. خوشكەكەی ژنی عەبدولمەلیك كوڕی مەروان بو. عەبدولمەلیك ئەوی وەك فەرمانداری سیستان دەستنیشان كرد. ئەو لە كوفە تێپەڕی كەحەجاج فەرمانڕەوایەتی دەكرد. پێیان وت: ئەگەر ئەم پیاوە بگاتە سیستان، بەو پەیوەندیەی لەگەڵ عەبدولمەلیك هەیەتی، ئەگەر یەكێك لەو كەسانەی بەدوای تۆدا دەگەڕێت، پەنا بۆ ئەو ببات، پەنای دەدات. حەجاج پرسی: ڕێگەچارە چیە؟ وتیان: دەڕۆیتە لای و سلاوی بۆ دەنێریت و باسی ئازایەتی و بوێری ئەو دەكەیت و پێی دەڵێیت: شەبیب مەبەستی كوفەی كردوە و منی بێزار كردوە. هیوادارم خوا لەسەر دەستی تۆ زیانی ئەو لەئێمە دور بخاتەوە و ئەم كارە ببێتە هۆی ناوداری و گەورە بونی تۆ.

حەجاج ئەو كارەی كرد. محەممەد وەلامی دایەوە و بۆ شەڕی شەبیب ڕێگەی گۆڕی. شەبیب پەیامی بۆ نارد كە: تۆ فریودراویت و حەجاج تۆی كردۆتە قەڵغانی خۆی. تۆ دراوسێیت و مافت بەملی منەوە هەیە. شوێن كاری خۆت بكەوە. خوا بەشایەت دەگرم كە ئازار و زیان لەتۆ نەدەم. محەممەد كوڕی موسا پێداگری كرد تا لەگەڵ شەبیب شەڕ بكات. شەبیب نێردراوكەی بۆ لای محەممەد ڕەوانە كرد. محەممەد ڕازی نەبو و داوای شەڕی دەستەویەخەی كرد. بەتین كوڕی قەعنەب و سوەید كوڕی سەلیم ڕوبەڕوی بونەوە. محەممەد وتی: تەنیا لەگەڵ شەبیب شەڕ دەكەم. شەبیبیان ئاگادار كردەوە. شەبیب ڕوبەڕوی بویەوە و پێی وت: سەبارەت بەخوێنی خۆت سوێندت دەدەم بەخوا چونكە دراوسێی منیت. محەممەد ڕازی نەبو. شەبیب گورزێكی ئاسنینی لەسەریدا كە سەری پان و پلیش كردەوە. ئەو كەوت و مرد. شەبیب كفنی كرد و بەخاكی سپارد و ئەوەی لەسوپاكەی دەستی كەوتبو، فرۆشتی و بەهاكەی بۆ بنەماڵەی محەممەد ڕەوانە كرد و بەم شێوەیە داوای بەخشینی لەهاوەڵانی خۆی كرد كە: ئەو دراوسێی من بو و شیاوە بۆمن ئەوەی وەك تالانی دەستم دەكەوێت، بە ناباوەڕان ببەخشم.

## شەڕی شەبیب لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس

## کوژرانی عوسمان کوڕی قەتەن

حەجاج، عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەسی بانگ کرد و فەرمانی پێدا شەش هەزار سوارکار لەناو خەڵکان هەڵبژێرێت و بەدوای شەبیبدا بگەڕێت. عەبدولرەحمان ئەو کارەی کرد و ڕەوانە بو. حەجاج بۆ ئەو و هاوەڵانی نامەی نوسی وئەوانی ترساند کەئەگەر شکست بخۆن، گیرۆدەی کوشتار و سەرکوت کردن دەبنەوە. عەبدولرەحمان گەیشتە مەداین و سەردانی جەزلی کرد تا پەرستاری و تیماری بکات. جەزل پێشنیاری دورئەندێشی پێکرد و لەبەرابەر شەبیب و سوپاکەی وشیاری کردەوە و یەکێك لەئەسپەکانی خۆی بەناوی فوسەیفەسای بەو بەخشی. ئەم ئەسپە هیچ ئەسپێکیتر نەیدەتوانی پێشی بکەوێت؟ عەبدولرەحمانماڵئاوایی لێکرد و بەڕێکەوت.

شەبیب بەرەو دەقوقا و شارەزور ڕەوانە بو. عەبدولرەحمان شوێن شەبیب کەوت و کاتێك گەیشتە سنورەکان، وەستا و وتی: ئەمە سەرزەمینی موسڵە و پێویستە خەڵکانی موسڵ بەرگری لێ بکەن. حەجاج نامەی بۆ نوسی: دوای سڵاو، شوێن پێی شەبیب هەڵبگرە تا بیدۆزیتەوە و بیکوژیت یا بۆ دوردەستەکان دوری بخەیتەوە چونکە فەرمانڕەوایی تایبەتە بەسەروەری باوەڕداران و سوپاییەکان هەمو شەڕکەرانی ئەون. ماڵئاوا.

عەبدولرەحمان بەدوای شەبیب بەڕێکەوت. شەبیب ئەم فێڵەی بەکار دەبرد کە ڕێگەی دەدا عەبدولرەحمان لێی نزیك بێتەوە و دواتر لەناکاو هێرشی دەکردەسەر بەلام کاتێك دەیبینی سەنگەری هەڵکەندوە، دەستبەرداری دەبو و بەڕێگەی خۆیدا دەڕۆشت. عەبدولرەحمان بەدوای ئەودا دەگەڕا. کاتێك شەبیب ئاگادار بویەوە کە ئەوان لە چ ڕێگەیەکەوە دەڕۆن، لەکاتی شەو کەئەوان بەڕێگادا دەڕۆشتن، هێرشی دەکردە سەر ئەوان و دەیبینی کە بۆ شەڕ ئامادەن، لەبەر ئەمە نەیدەزانی لەچ شوێنێکەوە زیان بەوان بگەیێنێت. دواتر ئەم شێوەی گرتەبەر کە کاتێك عەبدولرەحمان لێی نزیك دەکەوتەوە، بیست فەرسەخ بۆ پێشەوە دەڕۆیشت و لەسەرزەمینێکی نارێك و دژوار دادەبەزی و

عەبدولرەحمان شوێن ئەو دەکەوت. کاتێك لێی نزیك دەکەوتەوە، ئەو کارەی دوبارە دەکردەوە. ئەم کارە، سوپاکەی بێزار کرد و سمی ئەسپەکانیان سوا و شەڕکەران بەم هۆیەوە گیرۆدەی دەرد و نەخۆشی جۆراوجۆر بون. عەبدولرەحمان بەشێوەیەکی بەردوەوام بەدوایدا دەڕۆشت تا ئەوی لەخانەقین و جەلەولا ءو سامەڕا دوورخستەوە. دواتر روی کردە بت کە یەکێك لەگوندەکانی موسڵە. تەنیا روباری حەوەلایا لەنێوان بت و سوادی کوفەدا بو. ئەمە لەشوێنی رازانی سەرو لەسەرزەمینی موسڵ بو. عەبدولرەحمان لەکەنارەکانی روبارەکە دابەزی.

شەبیب پەیامی بۆ عەبدولرەحمان رەوانە کرد و وتی: ئەم رۆژانە بۆ ئێمە وئێوە جەژنە (مەبەستی جەژنی قوربان بو). ئایا دەخوازیت ئاگربڕ راگەیێنین تا ئەم رۆژانە تێپەڕێت. عەبدولرەحمان رازی بو. ئەو حەزی دەکرد شەر درێژە بکێشێت. عوسمان کوڕی قەتن نامەی بۆ حەجاج نوسی: دوای سڵاو، عەبدولرەحمان سەراسەری جوخی هەڵکەندوە تا ببێتە سەنگەر بۆی. باج کۆناکاتەوە و دەست بەرداری شەبیب بوە. ماڵئاوا. حەجاج نامەی بۆنوسی و فەرمانی پێدا بەرەو ئەو سوپایە بڕوات. ئەوی وەك فەرماندە دەستنیشان کرد و عەبدولرەحمانی لەسەر کار لابرد. حەجاج، موتەریف کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبەی بۆ مەداین رەوانە کرد. عوسمان بەرێکەوت تا گەیشتە عەبدولرەحمان و سوپاکەی خەڵکی کوفە. ئەو ئێوارێی سێ شەممە هەشتی زی حەجحە/ ١٩ مارسی ٦٩٦ زاییبی گەیشت. بەهەمان شێوە کەسوار لەسەر ئێسترەکەی خۆی بو، هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، بەرەو لای دوژمن بەرێکەون. خەڵك دژی ئەو راپەڕین و وتیان: ئێوارێیە و تاریکی کردوە و خەڵکان بۆ شەڕ خۆیان ئامادە نەکردوە. ئەمشەو بحەوێرەوە و دواتر بەئامادەیی تەواو بۆ شەڕ بەرێکەوە. ئەو بەردەوام دەیوت: بێ چەند و چون هێرش دەکەمە سەر ئەوان تا ئاشی مەرگ بۆ من بسورێت یا دژی من. عەبدولرەحمان هات و ئەوی دابەزاند.

شەبیب لەخانەقای بت دابەزیبو. خەڵکەکەی دەڕۆشتنە لای و دەیانوت: تۆ خۆشەویستی بەرامبەر بە ناتەوانان و ئەمان بەخشراوان دەنوێنیت و ئەو کەسانەی دەڕۆیتە لایان، سکاڵا بۆ لای تۆ بەرز دەکەنەوە و گوێ لەوتارەکانیان دەگریت. ئەوان یاخیان و ستەمکارانن کە لەگەڵ کەس قسە ناکەن و بەهیچ بەڵگەیەك رازی نابن. سوێند

بەخوا ئەگەر بزانن تۆ لەخانەقاکەی ئێمە ماویتەوە، کاتێك لێرە بڕۆیت، بێ چەند و چون ئێمە کوشتار دەکەن. ئەگەر دەخوازیت، لەکەنارەکانی گوندەکە دابەزە و وتارێکمان پێشکەش بکە. ئەو لە خانەقاکە هاتەدەر و وتارێکی پێشکەش بەخەڵکەکە کرد.

عوسمان سەراسەری شەو بەئاگا مایەوە و سوپاکەی بۆ شەڕ هاندەدا. کاتێك بەرەبەیانی چوارشەممە گەیشت، هەمو خەڵکی کۆکردەوە و لەم کاتەدا گێژەڵوکەیەکی سەخت هەڵیکرد و تەپ و تۆزی بەئاسماندا بڵاو کردەوە. خەڵك هاواریان کرد وپێیان وت: سوێندت دەدەین بەخوا ئێمە روبەروی ئەم گێژەڵوکە لەناوبەرە نەکەیتەوە و بۆ شەڕمان نەبەیت. ئەو رۆژە لەناو ئەواندا مایەوە. دواتر رۆژی پێنج شەممە هاتەدەر. خەڵکی بەتەواوی بۆ شەڕ ئامادە کردبو. خالید کوڕی نەهیك کوڕی قەیسی کردە فەرماندەی باڵی راست و عەقیل کوڕی شەدادی سەلولی کردە فەرماندەی باڵی چەپ. خۆی دابەزی و فەرماندەیی پیادەکانی گرتە ئەستۆ. شەبیب لەروبار تێپەڕی و بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت. لەم رۆژەدا سەد و هەشتا پیاوی شەڕکەر هاوڕێیەتیان دەکرد. براکەی موصادی وەك فەرماندەی دڵی سوپاکەی دەستنیشان کرد و سوەید کوڕی سەلیمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ و خۆی فەرماندەیی باڵی راستی گرتە ئەستۆ. هەردولای شەڕکەر پێشڕەویان دەست پێکرد.

شەبیب بەیارانی خۆی وت: من لای روبارەوە هێرش دەکەمە سەر باڵی چەپی ئەوان و کاتێك شکستیان بدەم، دەبێت فەرماندەی باڵی چەپی من هێرش بکاتە سەر باڵی راستی ئەوان و فەرماندەی دڵی سوپا لەشوێنەکەی خۆی نەجوڵێت تا فەرمانی منی پێدەگات.

ئەو هێرشی کردە سەر باڵی چەپی سوپاکەی عوسمان کەشکستیان خوارد و هەڵاتن. عەقیل کوڕی شەداد دابەزی و شەڕی کرد تا کوژرا. هەروەها مالك کوڕی عەبدالله‌ی هەمەدانی مامی عەیاش کوڕی عەبدالله مەنتوف کوژرا. شەبیب ڕۆشتە ناو سوپاکەی ئەوان. سوەید هێرشی کردە سەر باڵی راستی سوپاکەی عوسمان و شکستی پێ هێنان. فەرماندەکەیان خالید کوڕی نەهیك بو. شەڕی لەگەڵ کرد. شەبیب لەپشتەوە هێرشی کردەسەر و ئەوی لەناو برد.

عوسمان کوڕی قەتن پێشڕەوی کرد و گەورەکان و سەروەرانی خەڵك و سوارکاران

هاورێیەتیان دەکرد کە هێرشیان کردە سەر دڵی سوپاکەی شەبیب کەموصاد فەرماندەیی دەکرد. شەست پیاوی شەڕکەری لەگەڵدابو. کاتێك عوسمان لەوان نزیك کەوتەوە، موصاد هاورێ لەگەڵ هاوەڵانی هێرشی کردەسەر ئەوان و بڵاوەی پێکردن. شەبیب و سوارەکان لەپشتەوە هێرشیان کردنەسەر. عوسمان و هاورێکانیان نەکەوتبونەخۆ کەبینیان ڕمەکان لەسەر شانیان جێگیربوە و یەك یەك ئەوان دەکوژێت. سوەید کوڕی سەلیم هاورێ لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی هێرشی کردە سەر ئەوان. موصاد و سوپاکەی گەڕانەوە و پەرێشانیان لەخۆیان نیشاندا و عوسمان بەباشترین شێوە شەڕی کرد. دواتر خەواریج گەمارۆیان خستەسەر و موصاد براکەی شەبیب بەشمشێر لێیدا کە بەدەوری خۆیدا سوڕایەوە و وتی: فەرمانی خوا دەبێت ئەنجام بدرێت (احزاب/٣٣/٣٧). خەڵك ئەویان کوشت و عەبدولرەحمان کەوتە سەرزەوی. کوڕی ئەبی سەبرەی جوعفی سوار لەسەر ئێستر هاتە سەر سەری و ناسیەوە و لەگەڵ خۆی هەڵیگرت و لەناو خەڵك هاواری کرد: بەرەو دێری باوکی مریەم رابکەن. دواتر ئەو دوانە بەرێکەوتن و بەدوای کاری خۆیاندا ڕۆشتن.

واسڵی سەکونی ئەسپەکەی عەبدولرەحمان بینی کەجەزل پێی بەخشیبو. ئەسپەکە لەگۆڕەپانەکەدا دەسوڕایەوە. یەکێك لەهاوەڵانی شەبیب هەڵیگرت. گومانی کرد ئەو کوژراوە و لەناو کوژراواندا بۆی گەڕا بەڵام نەیدۆزیەوە. سەبارەت بەو پرسیاری کرد و ئاگاداریان کردەوە. واسڵ سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی بەدوایدا ڕۆشت و کۆیلەیەك سوار لەسەر ئێستر هاورێیەتی دەکرد. کاتێك لەو دوانە نزیك کەوتەوە، عەبدولرەحمان و کوڕی ئەبی سەبرە دابەزین تا شەڕ بکەن. کاتێك واسڵ ئەو دوانەی بینی، ئەوانی ناسیەوە و وتی: ئێوە لەکاتی پێویست لەدابەزین خۆتان بەدور گرت! ئێستا دامەبەزن! دەمامکی لەروخساری خۆی هەڵگرت و ئەو دوانە ناسیانەوە. بە کوڕی ئەشعەسی وت: ئەم ئەسپەم بۆ تۆ هێناوە تا سواری بیت. ئەو سواری بو و بەرێکەوت تا گەیشتە دێری بەقا و لەوێ دابەزی.

شەبیب فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا کە شمشێریان لەسەر خەڵك هەڵگرت و پێشنیاری بەیعەتی پێکردن.

عەبدولرەحمان شەوی لەدێری بەقا بەسەربرد. دو سوارە هاتن و ڕۆشتنە لای.

یەکێك لەو دوانە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ عەبدولرەحمان بەتەنیایی قسەی کرد. دواتر هاتنەدەر. زانرا ئەو پیاوە شەبیب بو. لەنێوان ئەو و عەبدولرەحمان پەیك و نامە گۆڕینەوە لەئارادا بو. عەبدولرەحمان بەرێکەوت تا گەیشتە دێری ئەبو مریەم. خەڵك لەدەوری کۆبونەوە و پێیان وت: ئەگەر شەبیب بەشوێنەکەی تۆ بزانێت، دێت و تۆ بۆ ئەو دەبیتە تاڵانی. ئەو بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەحەجاج خۆی شاردەوە تا ئەوەی ئەمانیان بۆ وەرگرت.

لێدانی درەم و دینارە ئیسلامیەکان

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی مەروان دینار و درەمی دروست کرد. ئەو یەکەم کەس بو لەئیسلامدا ئەو کارەی کرد. خەڵك لەم کارە سودی زۆریان دەست کەوت.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە ئەو لەسەرەوەی نامەکانی خۆی بۆ رۆمیەکان دەینوسی: قل هو الله احد (اخلاص/١/١١٢). دواتر ئاماژەی بە پێغەمبەر(د.خ) و بەروار دەکرد. پاشای رۆم نامەی بۆ نوسی: ئێوە لەنامەکانی خۆتان ئەمەوئەوەتان نوسیوە، دەست لەم کارە هەڵبگرن وەگەرنە لەناو دینارەکانی ئێمە شتێك سەبارەت بەپێغەمبەرەکەتان هەڵدەکەنرێت کە هیچ کات پەسندی ناکەن. ئەم کارەی پێ ناخۆش بو. ئەو خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویەی بانگ کرد و راوێژی لەگەڵ کرد. خالید وتی: دینارەکانی ئەوان نارەوا بکە و درەم لێ بدە کەتیایدا ئاماژە بەگەورەیی خوا بکرێت. لێرەوە بو عەبدولرەحمان دینار و درەمی ئیسلامی لێدا.

دواتر حەجاج درەمی لێدا و ئەم ئایەی تیا هەڵکەند: قل هو الله احد. خەڵك بۆ رێز گرتن لەقورئان ئەمەیان پەسەند نەکرد چونکە هەمو خەڵکان دەستیان لێدەدا. فەرمانیدا جگە لەو کەس درەم لێنەدات. سەمیری یەهودی درەمی تایبەت بەخۆی لێدا. حەجاج گرتی تا بیکوژێت. سەمیر وتی: عەیاری درەمەکانی من لەتۆ زیاترە، بۆ دەتەوێت بمکوژیت؟ حەجاج ئازادی کرد. سەمیر بۆ خەڵك بەردی کێشەکانی دروست کرد تا حەجاج وازی لێ بێنێت بەڵام حەجاج ئەو کارەی نەکرد. خەڵك کێشیان نەدەزانی و درەمەکانیان بەیەك هەڵدەسەنگاند. کاتێك سەمیر ئەم کارەی کرد لەفێڵ کردن لەیەك خۆیان بەدور گرت.

یەکەم کەس لەکاروباری تایبەت بەکێش، سەختگیری کرد و زیوی زیاتر لەپێشینانی

خۆی پاك و تایبەت كرد، عومەر كوڕی هوبەیرە لەرۆژگاری یەزید كوڕی عەبدولمەلیك بو. دواتر خالید كوڕی عەبداللە قەسری لەرۆژگاری هشام كوڕی عەبدولمەلیك كەزیاتر لەهوبەیرە سەختگیری دەكرد. دواتر یوسف كوڕی عومەر هاتەسەر كار كەسنوری بەزاند. رۆژێك عەیاری درەمێكی تاقی كردەوە و بینی تەواو نیە. لەبەر ئەمە هەزار قامچی لەدروستكەرەكان دا. ئەوان سەد دروستكەر بون و ئەو بۆ ئەو كەمیە، سەد هەزار قامچی وەشاند. باشترین دراوی ئومەوییەكان بەمشێوەیە بو: هۆبەیریە، خالیدیە، یوسوفیە. مەنسور لەكاتی باج وەرگرتن تەنیا ئەوانەی وەردەگرت. درەمەكانی سەرەتایان بە (ناپەسەند) لەقەڵەمدا.

دەستەیەك دەڵێن: (ناپەسەند) ئەو درەمانە بو كە حەجاج لێیدا و قل هو الله احد ی لەسەر نوسین و زایان ئەو كارەیان پێ ناخۆش بو چونكە هەمو كەسێك دەستی لێدەدا.

درەمی عەجەمەكان لەروانگەی گەورەیی و وردیەوە جۆراوجۆر بون. بەیەك مسقاڵ لێیان دەدا كە كێشەكەی بیست قیرات بو. هەندێكیان كێشەكەی دوانزە قیرات و هەندێكیان كێشەكەی دە قیرات بو. ئەمانە بەجۆرەكانی مسقاڵ لەقەڵەم دەدران. كاتێك درەمە ئیسلامیەكان لێدرا، كێشی بیست قیرات و دوانزە قیرات و دە قیراتیان كۆكردەوە و بە چل و دو قیرات خەملاَندیان. یەك لەسەر سێ گەی چواردە قیرات بو. كەواتە كێشی قیراتی عەرەبی چواردە قیراتە و بەم پێیە هەر دەدرەم، دەبێتە حەوت مسقاڵ.

دەستەیەك دەڵێن: مەصعەب كوڕی زوبەیر لەرۆژگاری عەبداللە كوڕی زوبەیر هەندێ درەمی لێدا كە لەسەردەمی عەبدولمەلیك لەناو بران.

وتاری یەكەم راسترە كە دەڵێت: عەبدولمەلیك یەكەم كەس بو درەم و دیناری ئیسلامی لێدا.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی حەکەم بەنوێنەرایەتی و میوانی گەیشتە دەرباری عەبدولەلیك.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولەلیك، ئەبان کوڕی عوسمانی وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان کرد.

ئەبان کوڕی عوسمان لەم ساڵەدا ئاییینی حەجی ئەنجامدا کە فەرمانداری مەدینە بو.

فەرمانڕەوای عێراق حەجاج و فەرمانڕەوای خوراسان ئومەییە کوڕی عەبداللە کوڕی خالد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە شورەیح و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە زورارە کوڕی ئەوفی.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان لەماڵتەوە هێرشی کردە سەر ئیمپراتۆری رۆم.

لەم ساڵەدا حەبە کوڕی جوەینی عورنی هاوڕێی عەلی کوڕی ئەبی تالب مرد.

## روداوەکانی ساڵی حەفتا و حەوتی کۆچی ( ٦٩٦ زایینی )

## شەڕی شەبیب لەگەڵ عەتاب کوڕی وەرقا و زوهرە کوڕی حوییە و کوژرانی هەردوکیان

لەم ساڵەدا شەبیب، عەتاب کوڕی وەرقای ریاحی و زوهرە کوڕی حەویەی کوشت.

پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك شەبیب سوپا رەوانە کراوەکەی حەجاجی بەفەرماندەیی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس و عوسمان کوڕی قەتن لەناو برد، ڕۆشتە (مام بێهرازان) و سێ مانگی هاوینی لەوێ بەسەر برد. خەڵکانێکی زۆر لەو کەسانەی خوازیاری سامان و سەروەری ئەم دنیابون یا قەرزاری حەجاج بو و یا حەجاج دەیویست (بەهۆکارێك) سزایان بدات، لەدەوری ئەو کۆبونەوە. کاتێك گەرما بەرەو نەمان ڕۆشت، شەبیب هاورێ لەگەڵ هەشسەد پیاوی شەڕکەر بەرەو مەداین بەرێکەوت. فەرماندارەکەی موتەریف کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبە بو. بەرێکەوت تا گەیشتە پردی حوزەیفە کوڕی یەمان. گەورەی بابل، مێهرود، هەواڵی ئەم کارەی بۆ حەجاج نوسی. کاتێك حەجاج نامەکەی خوێندەوە، لەناو خەڵکدا وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، یا بۆ پارێزگاری کردن لەخاك و سامانی خۆتان شەڕ بکەن یا دەنێرم بەشوێن کەسانێك کە لەئێوە فەرمانبەرتر و گوێڕایەڵتر و بۆ دژواری و گەرمی و ساردی و سەختیەکان لەئێوە خۆڕاگرتر بن تا شەڕ لەگەڵ دوژمنەکەی ئێوە بکەن و سامانەکانتان بخۆن.

خەڵك هەستان و وتیان: ئێمە لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەین. دەبێت سەروەرمان ئێمە بۆ شەڕی ئەوان رەوانە بکات. زوهرە کوڕی حەویە هەستا. ئەو پیرە پیاوێکی بەتەمەن بو کەنەیدەتوانی بەتەواوی لەسەر پێ بوەستێت مەگەر ئەوەی دەستیان دەگرت. وتی: خوا چاکە بەسەروەرمان ببەخشێت، تۆ خەڵك بەشێوەیەکی بەربلاو بۆ شەڕی ئەوان رەوانە دەکەیت، ئەوان بەشێوەیەکی کۆ رەوانە بکە وپیاوێکی ئازا و بوێر و خاوەن ئەزمون بکەرە فەرماندەی ئەوان کە هەڵاتن بەنەنگ و شەرمەزاری و خۆڕاگری بەهۆکاری سەرفرازی و رێزداری بزانێت. حەجاج وتی: تۆ ئەو پیاوەیت، بەرێکەوە.

زوهرە وتی: خوا سەروەرمان بهێڵێتەوە، بۆ شەڕ، پیاوێك شیاوە بتوانێت زرێیەكی ئاسنین لەبەر بكات و ڕم هەڵگرێت و شمشێر هەڵسورێنێت و بوێرئاسا لەسەر پشتی ئەسپ دانیشێت بەڵام من هێز و توانایی هیچ كام لەو كارانەم نیە چونكە سۆمایی چاوم لەدەست داوە و خۆم ناتەوان و لاواز بوم. لەجیاتی ئەو كارە، من لەگەڵ فەرماندە ڕەوانە بكە تا هاوڕێ و ڕاوێژكاری ئەو بم. حەجاج وتی: خوا باشترین پاداشتت بداتەوە چونكە كەسێكی چاكەخوازیت. دواتر وتی: ئەی خەڵكینە بۆ ڕۆشتن بۆ گۆڕەپانی شەڕ ئامادە بن.

خەڵك گەڕانەوە و سەرقاڵی ئامادە كردنی خۆیان بون و نەیاندەزانی چ كەسێك دەبێتە فەرماندەیان. حەجاج نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و ئاگاداری كردەوە كە شەبیب گەشتۆتە دەروازەكانی مەداین و دەیەوێت دەست بەسەر كوفەدا بگرێت و خەڵكانی كوفە لەشەڕكردن لەگەڵ ئەو ناتەوان بون و لەچەندین شەڕ شكستیان خواردوە. لەهەمو شەڕەكان فەرماندەكانیان كوژراوە و سوپاكەیان تێكشكاوە. داوای لێكرد سوپایەك لەشامەوە ڕەوانە بكات تا شەڕ لەگەڵ خەواریج ئەزمون بكات و زیانیان لەشارەكان دوربخاتەوە.

كاتێك نامەكەی حەجاج گەیشت، عەبدولمەلیك سوفیان كوڕی ئەبرەدی كەلبی لەگەڵ چوار هەزار پیاوی شەڕكەر و حەبیب كوڕی عەبدولرەحمانی حەكەمی هاوڕێ لەگەڵ دو هەزار شەڕكەر بۆ هاوكاری ئەو ڕەوانە كرد. حەجاج كەسی بەدوای عەتاب كوڕی وەرقای ڕیاحی ڕەوانە كرد كە لەگەڵ موهەلیبدا بو. بانگی كرد. عەتاب نامەی بۆ حەجاج نوسیبو و گلەیی لەموهەلیب كردبو، داوای لێكردبو بیگەڕێنێتەوە و لای خۆی كارێكی پێ بسپێرێت. عەتاب بەردەوام داوای لەموهەلیب دەكرد لەسامانەكانی پارس ڕۆژی خەڵكانی كوفەی هاوڕێی ئەو بدات. موهەلیب بەداواكەی ڕازی نەبو و لەبەر ئەمە بێزاری و ناسازگاری كەوتە نێوانیان كە ئەوەندەی نەمابو شەڕی لێبكەوێتەوە. موغەیرە كوڕی موهەلیب بوبە نێوەنجیگەر لەنێوان ئەم دوانە و فەرمانی بەباوكی خۆیدا ڕۆژی بەخەڵكانی كوفە بدات. موهەلیب بەداوای كوڕەكەی ڕازی بەڵام عەتاب كوڕی وەرقا ڕەنجابو. نامەی بۆ حەجاج نوسی و سكاڵای لەموهەلیب كرد.

كاتێك نامەكەی گەیشت، حەجاج لەم كارە شادمان بو و بانگی كرد. دواتر حەجاج

خەڵکانی کوفەی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد تا چ کەسێك وەك فەرماندەی شەڕکەران لەگەڵ خەواریج دەست نیشان بکات. وتیان: بۆچونی تۆ پێش هەمومانە. حەجاج وتی: من کەسم بەدوای عەتاب رەوانە کردوە کە ئەمشەو یا سبەی شەو دەگات. زوهرە وتی: ئەی سەروەر، هەڵبژاردنێکی راستت ئەنجامدا. سوێند بەخوا ناگەڕێینەوە تا سەرکەوتن بەدەست دێنین یا دەکوژرێین.

قەبیصە کوڕی والق پێی وت: خەڵك باسی ئەوە دەکەن کە سوپایەك لەخەڵکانی شام بۆ هاوکاری تۆ هاتوە. خەڵکانی کوفە شکستیان خواردوە و هەلاتن لەبەرچاو و دڵی ئەوان ریسوا بوە وەك بڵێی دڵیان نیە. ئەگەر دەخوازیت کەسێك بۆ لای خەڵکانی شام رەوانە بکە تا وشیار بن و شەو نەخەون مەگەر ئەوەی پاسەوانەکان دەست نیشان بکەن و دورئەندێش بن چونکە تۆ لەگەڵ خەڵکانێکی فێڵباز و گەڕۆك شەڕ دەکەیت کەزۆر جار خەڵکی کوفەت بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کردوە و پشت بەوان نابەستیت. شەبیب بەشێوەیەکە کاتێك لەشوێنێکدا بێت، لەناکاو لەشوێنێکیتر دەبینرێت و من ئاسودە نیم کە لەناکاو هێرش بکاتە سەر خەڵکانی شام و لەناویان ببات. ئەگەر ئەوان لەناو بچن، ئێمەیش لەناو دەچین و عێراقمان لەدەست دەڕوات.

حەجاج وتی: دەسخۆش و ئافەرین، وتارێکی بەجێ بو ئەوەی هێناتە سەرزمان. حەجاج کەسی بۆ لای خەڵکانی شام رەوانە کرد و فەرمانی پێدان تا لەرێگەی عین التمرەوە بێنە ناو کوفە. ئەو کارەیان کرد.

عەتاب کوڕی وەرقا ئەهەمان شەو گەیشت. حەجاج ئەوی کردە فەرماندەی سوپاکە. ئەو لەعەین حەمام ئوردوی لێدا. شەبیب هات تا گەیشتە کولوازی و لەوێوە دەجلەی بڕی و دواتر بەرێکەوت تا لەشاری بەهرسیر دابەزی و پردی دەجلە کەوتە نێوان ئەو و موتەریف. موتەریف لەپردەکە تێپەڕی و کەسی بۆ لای شەبیب رەوانە کرد و پێی وت: لەگەورەکانی سوپاکەت چەند کەسێك رەوانە بکە تا قورئان بخوێنین و بزانین چ پێشنیار و داواکاریەکیان هەیە. ئەو قەعنەب کوڕی سوەید و موحەلیل و چەند کەسێکیتری رەوانە کرد و چەند کەسێکی وەك بارمتە لەموتەریف گرت تا ئەوان بگەرێنەوە. ئەوان بۆ ماوەی چوار رۆژ لای موتەریف مانەوە بەلام لەسەر هیچ شتێك رێکنەکەوتن. کاتێك بینی موتەریف ملکەچی فەرمانەکانی نابێت، بۆ رۆشتن بۆ شەڕی عەتاب خۆی ئامادە

کرد و بەسوپاکەی خۆی وت: مەبەستی ئەوەم کردبو لەگەڵ سوارە هەڵبژێردراوەکان هێرش بکەمە سەر سوپاکەی خەڵکی شام پێش ئەوەی پەیوەستی فەرمانداریکی وەك حەجاج ببن و دەستیان بەشاری کوفە بگات بەلام موتەریف لەم کارە دوری خستمەوە. ئێستا سیخورەکانم ئاگاداریان کردومەتەوە کە پێشەنگەکانی ئەوان لەعین التمرن و ئێستا لەنزیك کوفە جێگیرن. ئاگاداریان کردومەتەوە کە عەتاب و سوپاکەی لەبەسرەن. ئێمە زۆر لەیەك نزیکین، بۆ هێرش کردنە سەر عەتاب خۆتان ئامادە بکەن.

موتەریف کوری موغەیرە ترسا کە هەواڵی پەیك و پەیامی لەگەڵ شەبیب بەگوێی حەجاج بگات. ئەو هاتەدەر و رێگەی کوێستانەکانی گرتەبەر. شەبیب موصادی برای رەوانە کرد کە پردەکەی بەست. عەتاب پێشرەوی کرد و لەبازاری حەکەمە دابەزی. سوپاکەی لەچل هەزار پیاوی شەرکەر پێکهاتبو. گەنجەکان و کەسانیتر دەهەزار کەس بون و بەم پێیە ژمارەیان دەگەیشتە پەنجا هەزار کەس. کاتێك بەرێکەوتن، حەجاج پێی وتن: بۆ تێکۆشەر رێزداری و پاداشت ئامادە کراوە و بۆئەو کەسەی هەڵدێت ریسوایی و سزا. سوێند بەو کەسەی جگە لەو خوایەك نیە، ئەگەر لەم شەرە هاوشێوەی شەرەکانی پێشو شەر بکەن، جلێکی ئەستور و زبرتان لەبەر دەکەم و بەند دەکەمە دەست وپێتان.

کاتێك عەتاب گەیشتە بازاری حەکەمە، شەبیب هێرشی کردە سەر. هاورێکانی ئەو لەمەداین هەزار پیاو بون. ئەوانی بۆ شەر هاندا و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت. دەستەیەك لەهاوەلانی پاشەکشێیان کرد. ئەو نوێژی نیمەرۆی لەساباط خوێند و دواتر نوێژی ئێوارێی خوێند و بەرێکەوت تا لەعەتاب و لەشکرەکەی نزیك کەوتەوە. کاتێك ئەوانی بینی، دابەزی و نوێژی شەوی خوێند. عەتاب سوپاکەی خۆی بۆ شەر ئامادە کردبو. فەرماندەی باڵی راستی بەمحەممەد کوری عەبدولرەحمان کوری قەیس سپارد وپێی وت: ئەی زادەی براکەم، تۆ پیاوێکی پاك نەژاد و خۆراگریت. وەلامی دایەوە: سوێند بەخوا تا یەك شەرکەر لام بمێنێتەوە، خۆراگری دەکەم. بەقەبیصە کوری والقی سەعلەبی وت: فەرماندەیی باڵی چەپ بگرە ئەستۆ. وەلامی دایەوە: من پیرەپیاوێکی بەتەمەنم و ناتوانم لەشوێنەکەم هەستم مەگەر ئەوەی کەسانیتر دەستم بگرن. عەتاب، فەرماندەیی باڵی چەپی بەنوعەیم کوری عولیەم سپارد. فەرماندەیی پیادەکانی بەحەنزەلە کوری حارسی یەربوعی سپارد کە کورە مامی خۆی و پیاوێکی رێزدار و گەورەی بنەماڵەکەی

خۆی بو. ئەوانی کردە سێ ریز: ریزێك پێکهاتو لەشمشێر وەشێنەکان، ریزێك رم هەڵگرەکان و ریزێك تیرهاوێژەکان. دواتر بەناو خەڵکاندا گەڕا و ئەوانی بۆ شەڕ هاندا و داستانەکانی بۆ گێرانەوە. وتی: شاعیرەکەمان لەکوێیە؟ کەس وەڵامی نەدایەوە. وتی: ئایا کەس نیە هۆنراوەکانی عەنتەرە بخوێنێتەوە؟ کەس وەڵامی نەدایەوە. وتی: پەنا بەخوا، دەتانبینم لەگۆڕەپانی شەڕ عەتاب بەتەنیا جێ دێڵن بەشێوەیەك بای گۆڕەپان بەسەریدا هەڵدەکات.

بەرێکەوت تا گەیشتە دڵی سوپاکەی و دانیشت و زوهرە کوڕی حەویە لەگەڵیدا بو. عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس و ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی جەهمی عەدەویش هاورێیەتیان دەکرد. شەبیب هاورێ لەگەڵ شەشسەد کەس لەشەڕکەرانی خۆی گەیشت چونکە چوارسەد کەسیان پاشەکشێیان کردبو. وتی: ئەوانەی نەیاندەویست لەناو ئێمەدا ببینرێن، خۆیان دورخستەوە. سوەید کوڕی سەلیمی لەگەڵ دوسەد شەڕکەر لەباڵی چەپ جێگیر کرد، موحەلیل کوڕی وایلی هاورێ لەگەڵ دوسەد شەڕکەر لەدڵی سوپاکەی و خۆی لەگەڵ دوسەد شەڕکەر ئاڵای باڵی راستی هەڵگرد. ئەمە لەکاتی شەو و نوێژی خەوتنان بو کەرووبکردە سوپاکەی عەتاب و هاواری کرد و وتی: ئەم ئاڵایە هی کێیە؟ وتیان: رەبیعە. وتی: ماوەیەکی زۆر ئەم ئاڵایە هاوکاری راستی و دروستیان کرد و ماوەیەکی زۆر هاوکاری چەوتی و خواری. سوێند بەخوا بۆ رەزای خوا شەڕیان لەگەڵ دەکەم، من شەبیبم، داوەری تایبەت بەخوای داوەری دادپەروەرە، ئەگەر دەتوانن خۆڕاگری بکەن! دواتر هێرشی کردە سەرئەوان وبلاوەی پێکردن. هەڵگرانی ئاڵاکانی قەبیصە کوڕی والق و عوبەید کوڕی حولەیس و نوعەیم کوڕی عولەیم سەرسەختانە خۆڕاگریان کرد و کوژران. باڵی چەپ بەتەواوی شکستی خوارد و شەڕکەرانی هەڵاتن. پیاوانێك لەرەبیعە هاواریان کرد: قەبیصە کوژرا. شەبیب وتی: ئێوە ئەوتان کوشت. داستانەکەی بەم شێوەیە کە خوای گەورە فەرمویەتی: بۆ ئەوان داستانی ئەو کەسە بخوێنەرەوە کەنیشانەکانی خۆمان بەو بەخشی و ئەو خۆی بەدور گرت (اعراف/١٧٥/٧) دواتر رۆشتە سەر سەری و وتی: هاوار لەتۆ، ئەگەر لەسەر باوەری یەکەمینت دەمایتەوە (باوەڕت نەدەگۆڕی) بەختەوەر دەبویت! بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەم پیاوە رۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا و دواتر هاوکاری ستەمکارانی کرد و

روبەروی ئێوە بویەوە.

شەبیب لەباڵی چەپی خۆیەوە هێرشی کردە سەر عەتاب و سوەید کوڕی سەلیم هێرشی کردە سەر باڵی راست کەفەرماندەکەی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس بو. ئەو لەگەڵ شەڕکەرانی تەمیم و هەمەدان شەڕی لەگەڵ ئەوان ئەزمون کرد. خۆڕاگریان کرد تا پێیان وترا عەتاب کوژرا. لەم کاتەدا دەستیان لەشەڕ هەڵگرت.

عەتاب لەناو دڵی سوپاکەی لەگەڵ زوهرە کوڕی حەویە لەسەر راخەرێك دانیشتبو کە لەناکاو شەبیب ئەوانی گەمارۆدا. عەتاب پێی وت: ئەی زوهرە، ئەمرۆ رۆژێکە ژمارە فراوان بو و بێ نیازی کەم بویەوە، هاوار لەمن بۆ پێنسەد سوار لەتەمیم کە لەهەمو خەڵکان باشتر بون. ئایا کەس نیە لەبەرابەر دوژمنان خۆڕاگری بکات؟ ئایا کەس نیە گیانی خۆی ببەخشێت؟ شەڕکەران لەدەوری ئەو بڵاوەیان کرد و بەتەنیا جێیان هێشت. زوهرە پێی وت: ئەی عەتاب، چەندە کارێکی چاك بو ئەوەی تۆ کردت، کارێکت کرد کە کەس هاوشێوەی تۆ ناکات، مژدەت لێ بێت، چونکە هیوادارم خواوەند لەو کاتەی ژیانی ئێمەی درێژ کردۆتەوە، گیان بەخشینی بەئێمە بەخشیبێت.

کاتێك شەبیب لێی نزیك کەوتەوە، هاورێ لەگەڵ دەستەیەك لەو کەسانەی (کە لەکاتی هەڵاتنی خەڵك لای ئەو مابونەوە) لەشوێنەکەی خۆی هەستا. پێیان وت: عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەس هەڵاتوە و دەستەیەکی فراوان لەخەڵکانی بەدوایدا رۆشتون. وتی: نەمبینیوە، ئەو گەنجە ترسی لەکارەکانی خۆی هەبێت. خۆڕاگریان کرد و شەڕیان کرد. پیاوێك لەسوپاکەی شەبیب ئەوی بینی و بەرم هێرشی کردەسەر. سوارەکان زوهرە کوڕی حەویەیان پێشێل کرد و چونکە نەیدەتوانی لەشوێنەکەی هەستێت، بەشمشێر پارێزگاری لەخۆی دەکرد کە فەزل کوڕی عامری شەیبانی هات و کوشتی. شەبیب بەدوایدا گەڕا و بینی کوژراوە، ئەوی ناسیەوە و وتی: ئەمە زوهرە کوڕی حەویەیە. سوێند بەخوا هەرچەندە بەگومڕایی کوژراییت، بەڵام رۆژانێکی زۆر لەبەرژەوەندی موسوڵمانان شەڕت کرد و پیاوانە دەستت بەسەر زۆر لەگوندەکاندا گرت و بێ نیازیت فراوان کرد. خوا چارەنوسی ئەوی بەو شێوەیە دیاری کرد کە لەکاتی هاوکاری کردنی ستەمکاران بکوژرێت. شەبیب لەقوڵایی دڵەوە بۆ ئەو گریا. پیاوێك لەهاوەڵانی پێی وت: تۆ بۆ پیاوێکی ناباوەڕ و خوانەناس دەگریت. شەبیب پێی وت: تۆ

زیاتر لەمن ئاشنایی گومڕایی ئەوان نیت بەڵام من لەرۆژگاری کۆنی ئەوان شارەزام کە تۆ لێی بێ ئاگاییت، ئەو کارانەی ئەگەر لەسەر ئەنجامدانی بەردەوام دەبون، ئێستا لەهاوەڵانی ئێمە دەبون.

شەبیب شمشێری لەسەر خەڵکان و شەڕکەران هەڵگرت و وتی: شمشێرەکانتان بخەنە ناو کالان. ئەو پێشنیاری بەیعەتی بەخەڵك کرد و خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ کرد و شەوانە هەڵاتن. شەبیب هەمو سامانی ناو لەشکرگەکەی هەڵگرت و پەیامی بۆ موصادی برای رەوانە کرد کە لەمەدائینەوە گەیشتە لای. دوای ئەم شەڕە، شەبیب بۆ ماوەی دو رۆژ لەبەیت قەرە مایەوە و دواتر بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەسورا دابەزی و فەرماندارەکەی کوشت.

لەم کاتەدا سوفیان کوڕی ئەبرەدی کەلبی و سوپاکەی شام گەشتنە ناو کوفە و پشتی حەجاجیان بەهێز کرد و ئەو بەبونی سوپاکەی شام، نیازی بەخەڵکانی کوفە نەمابو. رۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، خوا بەرێز ناکات ئەو کەسەی بیەوێت بەهێزی ئێوە ڕێزدار ببێت، هاوکاری کەسێك ناکات داوای هاوکاری لەئێوە بکات. ئێمە بەجێبێڵن و شایەتی شەڕی ئێمە لەگەڵ دوژمنان مەبن، لەگەڵ جولەکە و مەسیحیەکان لەحیرە بمێننەوە، کەس لەم شەڕەدا بەشداری نەکات مەگەر ئەوەی لەسوپاکەی عەتاب کوڕی وەرقا ئامادە نەبوبێت.

## هاتنی شەبیب بۆ کوفە و هەڵاتنی ئەو لەکوفە

شەبیب لەگوندی سورا بەرێکەوت و لەعەین حەمام دابەزی. حەجاج، حارس کوڕی معاویەی سەقەفی بانگ کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەپاسەوانەکان لەوکەسانەی لەسوپاکەی عەتاب ئامادە نەببون، بۆ شەڕی شەبیب، رەوانەی کرد. ئەو هاورێ لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر بەرێکەوت و لەزوراره دابەزی. ئەم هەواڵە بەشەبیب گەیشت. بەخێرایی بەرەو حارس کوڕی معاویە رێگەی بڕی و کاتێك گەیشت، هێرشی کردەسەر و کوشتی و بڵاوەی بەسوپاکەی کرد. تێکشکاوەکان کۆبونەوە و خزانە ناو کوفە. شەبیب لەنزیك کوفە ئوردوی لێدا و سێ رۆژ مایەوە. لەرۆژی یەکەم جگە لەکوژرانی حارس هیچ کارێك ئەنجام نەدرا.

بۆ رۆژی دوەم، حەجاج کۆیلەکانی خۆی رەوانە کرد کە سەر کۆڵانەکانیان گرت.

شەبیب بەرێکەوت و لەسەبخە دابەزی و بناغەی مزگەوتێکی داڕشت. بۆ رۆژی سێیەم، حەجاج، کۆیلەکەی خۆی ئەبو ئەلوەردی لەگەڵ کۆیلەکان رەوانە کرد و وای نیشاندا کەحەجاج خۆیەتی. شەبیب هێرشی کردەسەر و کوشتی و وتی: ئەگەر ئەمە حەجاج بێت، ئێوەم لەزیانی ئەو ئاسودە کرد.

دواتر حەجاج کۆیلەکەی خۆی تەهمانی بەجل وبەرگی خۆیەوە رەوانە کرد. شەبیب ئەویشی کوشت و وتی: ئەگەر ئەمە حەجاج بێت، ئیوەم لەزیانی ئەو ئاسودە کرد.

ئەوسا لەکاتی نیمەڕۆ حەجاج خۆی لەکۆشك هاتەدەر و داوای ئێسترێکی کرد و سواری بو و مەبەستی ئەوەی کرد بەرەو سەبخە بڕوات. کاتێك سواربو، خەڵکانی شامیش سوار بون و شان بەشانی ئەو رێگەیان بڕی. حەجاج هاتەدەر. کاتێك حەجاج شەبیب و سوپاکەی ئەوی بینی، دابەزی. شەششەد پیاوی شەڕکەر هاورێیەتی شەبیبیان دەکرد. ئەو رویکردە حەجاج و حەجاج سیرە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف لەسەر کۆڵانەکان جێگیر کرد و دەستەیەك لەخەڵکانی کردە هاورێی ئەو. حەجاج داوای چوارپایەیەکی کرد و لەسەری دانیشت و هاواری کرد: ئەی خەڵکانی شام، ئێوە خەڵکانێکی خۆڕاگر و گوێرایەڵ و بروادارن، ناراستی و چەوتی ئەم گلاوانە بەسەر راستی و دروستی ئێوەدا زاڵ نەبێت، چاوتان ببەستن و پشت بەئەژنۆتان ببەستن و بەنوکی ڕمەکانتان هێرشیان بکەنەسەر. ئەو کارەیان کرد و ڕمەکانیان بەرز کردەوە کە هاوشێوەی تەپۆڵکەیەکی ڕەش بون. شەبیب بەسێ دەستەی شەڕکەر هاتەپێش: دەستەیەك لەگەڵ خۆی، دەستەیەك لەگەڵ سوەید کوڕی سەلیم و دەستەیەك لەگەڵ موحەلیل کوڕی وایل. بەسوەیدی وت: لەگەڵ سوارەکانت هێرش بکەرەسەریان. سوەید هێرشی کرد و ئەوان خۆڕاگریان کرد و بەرمەکانیان پێشوازیان لەوان کرد و ڕمیان لێدەدان تا ئەوەی سوەید و سوارەکانی ناچار بەگەڕانەوە کران.

حەجاج هاواری کرد: لەسەر ئەم کارە بەردەوام بن: فەرمانیدا و چوارپایەکەیان بردە پێش. شەبیب فەرمانی بەموحەلیدا هێرش بکاتە سەریان و ئەو کارەیشیان لەگەڵ موحەلیل کرد. حەجاج هاواری کرد: بەردەوام بن. فەرمانی دا و چوارپایەکەیان بردە پێش.

دواتر شەبیب لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی هێرشی کردەسەر ئەوان کەلەبەرابەر ئەویش

خۆڕاگریان کرد و لەسەر شێوازی شەڕکردنی خۆیان بەردەوام بون. ماوەیەکی درێژ شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و سەرئەنجام خەڵکانی شام ناچاریان کرد بۆ لای هاوەڵانی خۆی بگەڕێتەوە. کاتێك شەبیب خۆڕاگری ئەوانی بینی، هاواری کرد: ئەی سومید، لەگەڵ شەڕکەرەکانت هێرش بکەرەسەر خەڵکی ناو کۆڵانەکان لەوانەیە بتوانیت لەناویان ببەیت و لەپشتەوە هێرش بکەیتە سەر حەجاج و ئێمە لێرەوە. سومید هێرشی برد بەڵام خەڵکان لەسەر بانەکان و کۆڵانەکان ئەوانیان بەردباران و تیرباران کرد و ئەو بەناچار پاشەکشێی دەکرد. حەجاج، عوروە کوڕی موغەیرە کوڕی شەعەبی لەگەڵ سێسەد شەڕکەر لەخەڵکانی شام وەك پشتیوانی خۆی هەڵبژاردبو تا لەپشتەوە نەتوانن هێرش بکەنە سەری. شەبیب هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان هێرشی برد. حەجاج وتی: لەبەرابەر ئەم هێرشە خۆڕاگری بکەن چونکە دوای ئەوە سەرکەوتن هی ئێمەیە. ئەوان کەوتنە سەرئەژنۆ.

شەبیب هاوڕێ لەگەڵ هەمو سوپاکەی خۆی هێرشی کردە سەر ئەوان. ئەوان روبەرویان بونەوەو بەردەوام بەرم و شمشێر لێیان دەدان تا ئەوەی بەپاشەکشێی لەشوێنەکەی خۆیان ناچاریان کردن. شەبیب فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا لەئەسپەکانیان بێنەخوار. نیوەی ئەوان ئەو کارمیان کرد. حەجاج هات تاگەیشتە مزگەوتی شەبیب و دواتر وتی: ئەی خەڵکانی شام، ئەمە سەرەتای سەرکەوتنە. ئەو رۆشتە سەر بانی نوێژگەکە و دەستەیەك لەتیرهاوێژەکان هاورێیەتیان دەکرد تا ئەگەر خەواریج نزیك کەوتنەوە، تیربارانیان بکەن. سەراسەری رۆژیان بەشەڕ بەسەر برد تا ئەوەی هەر دولای شەڕکەر لەبەهێزی بەرابەرەکەی بێزار بو.

دواتر خالید کوڕی عەتاب بەحەجاجی وت: فەرمانی شەڕکردن لەگەڵ ئەوانم پێ بدە چونکە داغدارم. حەجاج فەرمانی پێدا. ئەو هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە هاتەدەر و مەبەستی لەشکرگەکەی شەبیبی کرد و لەپشتەوە هێرشی کردە سەریان. موصاد برای شەبیب و ژنەکەی ئەو غەزالەی کوشت و لەشکرگەکەی ئەوی سوتاند. هەواڵی ئەم کارە بەحەجاج و شەبیب گەیشت. حەجاج و هاوەڵانی تەکبیریان وت. بەڵام شەبیب، لەگەڵ هاوەڵانی سوار بو. حەجاج بەخەڵکانی شامی وت: هێرشیان بکەنەسەر چونکە لەئێستادا ترساون. ئەوان هێرشیان کردە سەر شەبیب و شکستیان پێهێنان و بۆ

هەلاتن ناچاریان کردن. شەبیب وەك پشتیوانی خەڵك مایەوە و لەدواوەی سوپاکەی خۆی ڕێگەی دەبڕی. حەجاج پەیامی بۆ سوارەکانی خۆی نارد: دەستبەرداری بین. ئەوان گەڕانەوە. حەجاج گەڕایەوە بۆ ناو کوفە و ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: سوێند بەخوا تا ئێستا کەس لەگەڵ شەبیب شەڕی نەکردبو. ئەو هەلات و ژنەکەی بەجێهێشت و قامیشیان لەقونی بڕی. دواتر حەبیب کوڕی عەبدولرەحمانی حەکەمی بانگ کرد و هاورێ لەگەڵ سێ هەزار سوار لەخەڵکانی شام بەدوای شەبیبدا ڕەوانەی کرد. پێی وت: لەهێرشە لەناکاوەکانی شەبیب بترسە و لەهەر شوێنێك ڕوبەڕوی بویتەوە، دابەزە، چونکە خواوەند شمشێرەکەی ئەوی کول کردوە، و دانەکانی شکاندوە.

ئەو بەدوای شەبیبدا بەڕێکەوت تا لەئەنبار دابەزی. حەجاج لەکاتی شکستی شەبیب جاڕیدابو: هەرکەس لەئێوە پەیوەستی ئێمە بێت، ئەمانی پێ دەبەخشرێت. زۆر لەهاوەڵانی شەبیب لەدەوری ئەو بلاوبونەوە. کاتێك حەبیب لەئەنبار دابەزی، شەبیب ڕوبەڕوی بویەوە. کاتێك گەیشتە نزیکی ئەوان، دابەزی و نوێژی شێوانی خوێند. حەبیب سوپاکەی خۆی بۆ چەندین دەستە دابەش کردبو و پێی وتبون: هەرکام لەئێوە پارێزگاری لەپانتاییەکەی خۆی بکات و ئەگەر ئەم دەستە شەڕی کرد، ئەو دەستەیتر هاوکاری نەکات چونکە خەواریج لەئێوە نزیکن، گوێرایەڵ بن لەسەر ئەو بنەمای شەڕ لەگەڵ هەموتان بکەن و هەموتان لەناو ببەن.

شەبیب کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە کە بەتەواوی بۆ شەڕ ئامادە بون. هێرشی کردە سەر دەستەیەك لەوان و شەڕ لەگەڵ ئەوان درێژەی کێشا بەلام هیچ کام لەوان تەنانەت یەك هەنگاو پاشەکشێی نەکرد. دواتر ئەوانی بەجێهێشت و هێرشی کردە سەردەستەیەکیتر و ئەوانیش بەهەمان شێوە خۆڕاگریان کرد. هێرشی کردە سەر دەستەی چوارەم و بەردەوام لەگەڵ ئەوان شەڕی دەکرد تا ئەوەی سێ لەسەر چواری شەو تێپەڕی. لەئەسپ هاتەخوار و لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد بەشێوەیەك دەستەکان لەجەستە جیادەبونەوە و کوژراوان فراوان بون. سی کەس لەسوپاکەی شەبیب و سەد کەس لەخەڵکانی شام لەناو خوێنی خۆیاندا گەوزان. هیلاکی و بێزاری بەسەر هەردولای شەڕکەر زاڵبو بەشێوەیەك پیاوێك شمشێری دەوەشاند بەلام نەیدەتوانی هیچ کارێك بکات و لەگەڵ ' کەسێکیتر کەدانیشتبو شەڕی دەکرد و نەیدەتوانی لەشوێنەکەی خۆی

هەستێت چونکە بێزار و لەتاو هیلاکی تواناى بزاوتنی نەبو.

کاتێك شەبیب لەوان هیوابڕاو بو، ئەوانی بەجێهێشت و بەرێگەی خۆیدا ڕۆشت. دیجلەی بڕی و روی لەسەرزەمینی جوخی کرد و جارێکیتر لەشوێنی واستەوە لەدیجلە پەڕیەوە و روی کردە پارس و دواى ئەوە کرمان تا خۆی و هاوەڵانی بۆ ماوەیەك بحەسێنەوە.

سەبارەت بەشکستی شەبیب ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکیتریش داوە. بەمشێوەیە: حەجاج ئەفسەرێکی بۆ شەڕی شەبیب رەوانە کرد کەئەوی کوشت و دواتر ئەفسەرێکی دیکەی رەوانە کرد کەئەویش کوژرا. یەکێك لەوان، ئەعیەن، خاوەنی (حمام عين) بو. دواتر شەبیب ڕۆشتە ناو کوفە و ژنەکەی غەزالە هاورێیەتی دەکرد چونکە پەیمانی دابو لەناو مزگەوتی کوفە دو رەکعەت نوێژ بکات و لەرەکعەتێکیان سورەی بەقەرە و لەرەکعەتەکەیتر سورەی (آل عمران) بخوێنێت. ئەو لەناو لەشکرگەکەی خۆی ماڵەکانی بەقامیش دروست کردبو. دواى ئەوەی خەڵك دژواری و ئازاری زۆریان لەشەبیبەوە پێبڕا، حەجاج شەوانە ئەوانی کۆکردەوە و سەبارەت بەشەبیب راوێژی لەگەڵ کردن. خەڵك سەریان داخست. قوتەیبە لەناو خەڵك هاتەدەر و وتی: ئایا فەرمان دەدەیت قسە بکەم؟ وتی: بەڵێ. وتی: سەروەری ئێمە نەپارێزگاری لەفەرمانە خواییەکان کردوە، نەچاکەی سەروەری باوەڕدارانی مەبەستە و نە ژێردەستەکان. وتی: چۆن؟ وتی: تۆ پیاوێکی پاك نەژاد رەوانە دەکەیت و لەگەڵ ئەو خەڵکانێکی ریسوا کەئەوان شکست دەخۆن وئەو شەرم دایدەگرێت و نایەوێت بگەرێتەوە و دەکوژرێت. وتی: بۆچونی تۆ چیە؟ وتی: خۆت روبەروی ببەرەوە و شەڕی لەگەڵ بکە. حەجاج وتی: لەشکرگەیەك بۆ من دیاری بکەن.

خەڵك هاتنەدەر و بەردەوام نفرین و جوێنیان بەعەنبەسە کوڕی سەعید دەدا چونکە ئەو بو سەبارەت بەشەبیب قسەی لەگەڵ حەجاج کرد بۆ ئەوەی ببێتە کەسێکی نزیکی ئەو. بەرەبەیانی بەیانی حەجاج نوێژی خوێند و خەڵکی کۆکردەوە و قوتەیبە کە لەشکرگەیەکی چاکی دەستنیشان کردبو، هات. ئەو ڕۆشتە لای حەجاج و بەئالآیەکی هەڵکراوە هاتەدەر و حەجاج بەدواى ئەودا بەرێکەوت و ڕۆشتە سەبخە کە شەبیب لەوێ بو. ئەمە لەرۆژی چوارشەممەدا بو کە هەردو سوپاکە روبەروی یەك بونەوە.

بەحەجاجی وت: جێگەکەی خۆتی نیشان مەدە. حەجاج شوێنەکەی خۆی شاردەوە و جل و بەرگێکی هاوشێوەی خۆی کردە بەر کۆیلەکەی خۆی ئەبو ئەلوەرد و بۆ شەڕی شەبیبی رەوانە کرد. شەبیب سەیری کرد و گورزێکی لەسەریدا و کوشتی. شەبیب هێرشی کردەسەر خالید کوڕی عەتا و هاورێکانی لەباڵی چەپی سوپاکەی حەجاج و تا رەحبە پاشەکشێی پێکردن. هێرشی کردە سەر مەتەر کوڕی ناجیە فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی حەجاج و شکستیدا. لەم کاتەدا حەجاج دابەزی و هاورێکانی دابەزین. ئەو لەسەر عابایەك دانیشت و عەنبەسە کوڕی سەعید لەگەڵیدابو. سەرقاڵ بون کە مەصقەلە کوڕی موهەلهیلی زەببی جڵەوی ئەسپەکەی شەبیبی گرت و وتی: سەبارەت بەساڵح کوڕی موسەرەح چی دەڵێیت و چۆن شایەتی دەدەیت؟ وتی: ئایا لەم کات و ساتەدا؟ وتی: بەڵێ. وتی: لێی بێزارم. مەصقەلە وتی: خوا لەتۆ بێزار بێت. لێی جیابویەوە و هاورێ لەگەڵ ئەو کەسانیتریش لەدەوری شەبیب بڵاوەیان کرد جگە لەچل سوار کە لەگەڵی مانەوە. حەجاج وتی: دوبەرەکی لەناو ئەواندا دروست بو. حەجاج کەسی بەدوای خالید کوڕی عەتاب رەوانە کرد کە رۆشتە لەشکرگەی خەواریج و شەڕی لەگەڵ کردن و غەزالە ژنەکەی شەبیب کوژرا و سەری براوی ئەویان بردە لای حەجاج. شەبیب ئەوی ناسیەوە و فەرمانی بەپیاوێکدا کە هێرشی کردە سەر سوارەکە و کوشتی و سەر براوەکەی وەرگرتەوە و لەبەردەم شەبیب خستیە سەرزەوی. فەرمانیدا کە شۆردیان و بەخاکیان سپارد.

ئەو خەڵکە لەپەنای پاسەوانان و پارێزەرانی خۆیان گەڕانەوە و خالید گەڕایەوە و هەواڵی گەڕانەوەی ئەوانی دا. حەجاج فەرمانی پێدا شوێنی کەوێت. ئەو شوێن پێی ئەوانی هەڵگرت و بەردەوام هێرشی دەکردە سەر ئەوان. هەشت پیاوی شەڕکەر گەڕانەوە و هێرشیان کردەسەر و تا رەحبە پاشەکشێیان پێکرد. لەم کاتەدا خوت کوڕی عومەیری سەدوسیان بردە لای شەبیب. شەبیب وتی: ئەی خوت، فەرمانڕەوایی تەنیا شیاوە بۆ خوا. وتی: خوت لەیارانی ئێوەیە بەڵام دەترسا. شەبیب ئازادی کرد. عومەیر کوڕی قەعقاعیان بردە لای شەبیب کە بەویشی وت: ئەی عومەیر، داوەری و فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا. وتی: گەنجی من لەرێگەی خوادا بەسەرچو. شەبیب جارێکیتر قسەکەی هێنایە سەرزمان: فەرمانڕەوایی و داوەری تەنیا شیاوە بۆ خوا. ئەو تێنەگەیشت کە

شەبیب چی دەوێت و لەبەر ئەمە شەبیب فەرمانیدا و سەریان بڕی.

براکەی شەبیب کوژرا و شەبیب چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو هەشت پیاوە بو کە شوێن خالید کەوتبون. ئەوان درەنگیان کرد. سوپاکەی حەجاج لەترسی شەبیب، شەڕیان نەگرد. هەشت هاوەڵەکەی شەبیب گەڕانەوە وئەوان بەرێکەوتن و خالید دوبارە شوێنیان کەوتەوە کە ڕۆشتنە ناو خانەقایەك لەمەداین و خالید گەماڕۆی خستە سەر ئەوان. هاتنەدەر و تا دوفەرسەخ راویان نان و سوپاکەی خالید لەکاتی هەڵاتن خۆیان فرێدایە ناو روباری دیجلە. خالید ئالأ بەدەست خۆی فرێدایە ناو روباری دیجلە. شەبیب وتی: خوا بیکوژێت، ئەمە شێرە پیاوی ئەم خەڵکانەیە. وتیان: ئەو خالید کوڕی عەتابە. وتی: کەسێکی ئازا و بوێرە، ئەگەر دەمناسی، شوێنی دەکەوتم تەنانەت ئەگەر خۆیشی فرێبدایەتە ناو روبارێك ئاگرەوە. دواتر (بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا) رەوانەی کرمان بو. حەجاج نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و داوای هاوکاری لێکرد و ئاگاداری کردەوە کە خەڵکی کوفە لەشەڕ لەگەڵ شەبیب ناتەوانن. عەبدولمەلیك سوفیان کوڕی ئەبرەدی هاوڕێ لەگەڵ سوپایەك بۆ هاوکاری کردنی ئەو رەوانە کرد.

## لەناوچونی شەبیبو لەم ساڵەدا شەبیب لەناوچو.

پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بو کەحەجاج دو مانگ دوای گەڕانەوەی شەبیب لەکوفە بۆ کرمان، سامانێکی زۆری لەناو سوپاکەی سوفیان کوڕی ئەبرەد دابەش کرد و فەرمانی بەسوفیاندا بۆ شەڕی شەبیب رەوانە ببێت. سوفیان بەرێکەوت. حەجاج بۆ هاوسەری کچەکەی حەکەم کوڕی ئەیوب (نوێنەری خۆی لەبەسرە) نامەی نوسی و فەرمانی پێدا چوارهەزار پیاوی شەڕکەری سوارکار لەخەڵکانی بەسرە بۆ هاوکاری سوفیان رەوانە بکات. حەکەم ئەوانی هاوڕێ لەگەڵ زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکی رەوانە کرد. ئەو نەگەیشتە سوفیان مەگەر ئەو کاتەی سوفیان لەکرمان روبەروی شەبیب بویەوە. شەبیب لەکرمان نیشتەجێ ببو. ئەو سوپاکەی حەوانەوە و دواتر شەبیب لەپردی دوجەیلی ئەهواز روبەروی سوفیان بویەوە. شەبیب لەپردەکە تێپەڕی و مەبەستی سوفیانی کرد. بینی سوفیان لەگەڵ سوپاکەی خۆی دابەزیوە و موهاصیر کوڕی سەیفی کردۆتە فەرماندەی سوارەکان. شەبیب لەگەڵ سێ دەستەی شەڕکەر گەیشت. شەڕێکی قورسیان کرد و شەبیب بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. دواتر خۆی و سوپاکەی بۆ سی جار

هێرشیان کردە سەر سوپاکەی سوفیان بەلام خەڵکانی شام لەشوێنی خۆیان نەجولان. سوفیان بەوانی وت: بلاوەی لێمەکەن، دەبێت پیاوەکان پێشڕەوی دەست پێبکەن. بەردەوام بەشمشێر و ڕم لێیان دەدان تا ئەوەی بۆ ئەوبەر پردەکە دوریان خستنەوە. کاتێك شەبیب گەشتە پردەکە، دابەزی و هاوڕێ لەگەڵ ئەو سەد شەرکەر لەئەسپەکانیان هاتنەخوار و تا ئێوارێ شەڕیان لەگەڵ خەڵکانی شام کرد و ئەوەندە بەشمشێر و ڕم لێیاندان کەهیچ کات بەو شێوەیە تامی شەڕیان نەچێشتبو.

کاتێك سوفیانی بینی، ناتوانێت لەبەرابەر شەبیب و سوپاکەی خۆڕاگری بکات و سەرکەوتنی ئەوان نزیك بۆتەوە، فەرمانی بەتیرهاوێژەکاندا تیربارانیان بکەن و ئەمە لەئێوارێدا رویدا. شەبیب و سوپاکەی هێرشیان کردە سەر تیرهاوێژەکان و نزیکەی سی کەس لەوانیان کوشت. دواتر رویان کردە سوفیان و هاوەلانی و ئەوەندە شەڕیان کرد تا شەو داهات و تاریکی پەردەیەکی ڕەشی بەسەر هەمو ناوچەکاندا بلاو کردەوە. دواتر شەبیب پاشەکشێی کرد. سوفیان بەسوپاکەی خۆی وت: شوێنیان مەکەون.

کاتێك شەبیب گەشتە پردەکە، بەهاوەلانی خۆی وت: بپەڕێنەوە و بەخواستی خوا دەمەوبەیان هێرش دەکەینە سەریان. ئەوان لەپێشەوە بەرێکەوتن و خۆی بەدوای ئەواندا. ئەو سوار ئەسپێکی نێر بو تا بپەرێتەوە. لەپێش ئەو مێچکە ئەسپێك بو. لەو کاتەی لەسەر پردەکە بون، ئەسپە نێرەکە پەڕیە سەر مایینەکە. پردەکە کەوتە لەرزین و سمی ئەسپەکەی لەلێواری پردەکە گیری کرد و ئەسپ و سوارەکە هەردوکیان کەوتنە ناو ئاوەکە. کاتێك کەوتەخوار، وتی: خوا کارێك ئەنجام دەدات کە دەبێت ببێت (انفال/٨/٤٢). کەوتە ناو ئاوەکە و دواتر هاتەسەر و وتی: ئەمە فەرمودەی خوای گەورە و بەرێزە (انعام/ ٦/ ٩٦). دواتر لەناوەکەدا خنکا.

سەبارەت بەکوژرانی ئەو ئاماژەیان بەگێرانەوەی دیکە داوە: ئەو لەگەڵ دەستەیەك لەکەسەکانی خۆی بو کەئەوان بەئەندازەی ئەم شارەزایی و تێگەشتنیان نەبو. ئەو لەبنەماڵەکانی ئەوان کەسانێکی زۆری کوشتبو و دڵی ئەوانی رەنجاندبو. یەکێك لەوان پیاوێك بەناوی موقاتل لەبەنی تەمیم کوڕی شەیبان بو. کاتێك شەبیب کەسانێکی لەبەنی تەمیم کوشت، ئەو هێرشی کردە سەر بەنی مورە کوڕی هەمام (بنەماڵەکەی شەبیب) و کەسانێکی لەوان کوشتار کرد. شەبیب پێی وت: ئەوانت بێ فەرمانی من

کوشت؟ وتی: ناباوەڕانت لەخەڵکەکەی من کوشت و منیش ناباوەڕانم لەخەڵکەکەی تۆ کوشت. لەئایینی ئێمە کوشتنی ئەو کەسانە ڕەوایە کە لەسەر ئایینەکەی ئێمە نەبن. تۆ کەسانی زیاترت لەبنەماڵەکەی من کوشت تا من لەبنەماڵەکەی تۆ. شیاو نیە بۆ تۆ ئەی سەروەری باوەڕداران دڵ بۆ کوژرانی ناباوەڕان بسوتێنیت. شەبیب وتی: ئەو کارە ناکەم.

هەروەها کەسانێکی زۆری لەگەڵدا بو کە شەبیب بنەماڵەکانی ئەوانی کوشتار کردبو. کاتێك ئەو بەدوای خەڵکان ڕێگەی بڕی، بەیەکیان وت: ئایا کاتی ئەوە نیە پردەکە بپچڕێنین و داخی دڵی خۆمان وەربگرین؟ پردەکەیان بڕی و کەشتیەکان ئەویان سوڕاند وئەسپەکەی ڕەمی کرد و کەوتە ناو ئاوەکە و خنکا. گێڕانەوەی یەکەم ڕاستترە.

خەڵکانی شام دەیانویست بگەڕێنەوە. خاوەنی پردەکە هات و بەسوفیانی وت: یەکێك لەوان کەوتە ئاوەکە و خنکا. خەواریج لەناو خۆیاندا هاواریانکرد: سەروەری باوەڕداران لەئاوەکەدا خنکا! دواتر ئەوان لەشکرگەکەی خۆیان بەجێهێشت و بەرێکەوتن بەشێوەیەك کەس لەوێ نەمایەوە. سوفیان تەکبیری وت و سوپاکەی تەکبیریان وت. سوفیان بەرێکەوت تا گەیشتە پردەکە وکەسی بۆ لەشکرگەکەی ئەوان ڕەوانە کرد وبینی کەسی لێ نیە و ئەوە خۆی باشترین لەشکرگەیە (بۆ تاڵان کردن). دواتر شەبیبیان لەئاوەکە دەرهێنا و سکیان هەڵدری و دڵیان دەرهێنا. بەڵام هاوشێوەی لەتە بەردێك بو و کاتێك دەیانکێشا بەتاشەبەردێکدا، تا بەرزایی ئەندامی کەسێك بەرز دەبویەوە.(!...!)

دەڵێن: هەواڵی مەرگی شەبیبیان بەدایکیدا و دەیانوت: ئەو کوژرا بەڵام دایکی باوەڕی نەدەکرد. کاتێك وتیان لەناو ئاودا خنکا، باوەڕی کرد و وتی: کاتێك ئەوم هێنایە دنیا، بینیم تیشکێکی ئاگرین بۆ ئاسمان بەرز بویەوە، لەبەر ئەمە زانیم تەنیا بەئاو دادەمرکێتەوە. دایکی شەبیب کەنیزێکی ڕۆمی بو کەباوکی کڕی و شەبیب لەرۆژی جەژنی قوربانی ساڵی بیست و پێنج / ٢٨ سێپتامبەری ٦٤٦ زایینی لەدایك بو. ژن وتی: بەهەمان شێوە کە کەسێکی خەواڵو دەیبینێت، بینیم لەناو ڕانم تیشکێکی ئاگرین هاتەدەر و درەخشان و تابان ڕێگەی ئاسمانی گرتەبەر و هەمو کەنارەکانی بڕی. لەو کاتەی دەدرەوشایەوە، لەناکاو کەوتە ناو ئاوکە و کوژایەوە. من ئەوم لەرۆژی جەژنی قوربان هێنایە دونیا کەنێوەی خوێنی تیا دەرێژن. بەم شێوە لێکدانەوەم بۆ خەوەکەی خۆم کرد کەکوڕەکەم خوێنی زۆر دەرێژێت و کاروبارەکانی بەخێرایی بەرەو گەورەیی

دەڕوات. باوکی بەردەوام ئەوی بۆ لەصەف (سەرزەمینی خەڵکەکەی) دەبرد. ئەو لەبەنی شەیبان بو.

## شۆڕشی موتەریف کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبە

دەڵێن: بەنی موغەیرە کوڕی شەعبە پیاوێکی چاکەکار و گەورەزا بون. خۆیان خەڵکانێکی ڕێزدار بون و باوکیان هاوشێوەی ئەوان. جیاواز لەمە، لەناو خەڵکەکەی خۆیان پێگەیەکی بەرزیان هەبو. کاتێك حەجاج هات و ئەوانی بینی، زانی ئەوان گەورە و سەروەری خەڵکەکەی خۆیانن. عوروەی کردە فەرمانداری کوفە، موتەریفی کردە فەرمانداری مەداین و حەمزەی کردە فەرمانداری هەمەدان. ئەوان لەسنوری فەرمانڕەوایەتی خۆیان بەشێوەیەکی چاکە لەگەڵ خەڵکان هەڵس و کەوتیان دەکرد و دوژمنی سەرسەختی گومان لێکراوان بون. کاتێك شەبیب شۆڕشی کرد و لەمەداین نزیك کەوتەوە، موتەریف کوڕی موغەیرە فەرمانداری ئەم شارە بو. پێشتر ئاماژەمان بەمەدا. ئەو نامەی بۆ حەجاج نوسی و داوای هاوکاری لێکرد. حەجاج، سەبرە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد. شەبیب بەرێکەوت تا لەبەهرسیر دابەزی. موتەریف لەشاری کۆنەدا بو و ئەمە ئەو شارەیە کە ئەیوانی خوسرەوی لێیە. موتەریف پردەکەی پچڕاند و کەسی بۆ لای شەبیب رەوانە کرد تا چەند کەسێك لەهاورێکانی بۆ لای ئەو رەوانە بکات بۆ ئەوەی لەبۆچون وپێشنیارەکانیان ئاگادار ببێتەوە. ئەو چەند کەسێکی بۆ لای موتەریف رەوانە کرد. موتەریف پرسیاری لێکردن تا بزانێت بانگەشە بۆ چی دەکەن. وتیان: پێشنیاری گەڕانەوە بۆ نوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر(د.خ) بەخەڵکان دەکەین. ئەوەی بۆتە هۆی ئەوەی دژی خەڵکەکەی خۆمان شۆڕش بکەین ئەوەیە سامانەکانیان تایبەت کردوە بەخۆیان و سنورەکانیان بڕیوە و بەشێوەیەکی ستەمکارانە فەرمانڕەوایی خەڵکان دەکەن.

موتەریف بەوانی وت: پێشنیارەکەتان لەسەر راستی و دروستیە و دژی ستەمکاران شەڕدەکەن. من هاودەنگی پێشنیار وبۆچونەکەی ئێوەم، لەگەڵ من بەیعەت بکەن تا کاروباری من و ئێوە یەك بگرێت و بەهێز ببین. وتی: پێشنیارەکانی خۆت باس بکە کە ئەگەر لەسەر راستی و دروستی بێت، رازی دەبین. وتی: پێشنیاری لایەنگری کردن لەنوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر و فەرمانڕەوایی کردنی موسوڵمان بەشێوەی

راوێژ کردن و هەڵبژاردنتان پێ دەکەم تا هەرکەسێك کە بیانەوێت، هەڵیبژێرن و ئەو شێوازی عومەر کوڕی خەتاب بەکار بیات و دوای خۆی کارێك بکات کە عومەر ئەنجامیدا و فەرمانڕەوایی بە (شۆرا) بسپێرێت بەهەمان شێوە کە ئەو سپاردی چونکە ئەگەر عەرەبەکان بزانن مەبەستی ئێمە لە(شۆرا) سپاردنی فەرمانڕەوایی بەقوڕەیشیەکانە، خەڵکان بەوە رازی و هاوەڵان و شوێنکەوتەکانی ئێوە فراوان دەبن. خەواریج وتیان: ئەمە شتێکە ئێمە پێی رازی نابین. هەستان و هاتنەدەر و بۆ ماوەی چوار شەو و رۆژ هاتوچۆیان کرد بەلأم بۆچون و پێشنیارەکانیان لەیەك نزیك نەکەوتەوە و لەبەر ئەمە خۆیان لەو بەدور گرت. موتەریف راوێژکاران و هاورێ گیانی گیانیەکانی خۆی بانگ کرد و ستەمی عەبدولەلیك و حەجاجی بیرخستنەوە و وتی من بەردەوام ناسازگار و ئارەزومەندی شەڕ لەگەڵ ئەم ستەمکارانەم و ئەگەر هاوەڵانێکم دەست کەوێت لەو کارە وەك ئەرکێکیی خوایی سەرشانی خۆم دەڕوانم . باسی ئاڵوگۆڕی بۆچونەکانی لەگەڵ یارانی شەبیب کرد و لەگفتوگۆکان ئاگاداری کردنەوە. وتی: ئەگەر ئێوە بەیعەتم لەگەڵ بکەن، عەبدولەلیك و حەجاج لەسەر کار لادەبەم. راوێژی لەگەڵ ئەوان کرد بۆ ئەوەی بزانێت، لەئێستادا دەبێت چی بکات.

پێیان وت: ئەم وتارە بەنهێنی بیهێڵەرەوە و لای کەس مەیدرکێنە. یەزید کوڕی ئەبی زیاد کۆیلەی باوکی موغەیرە کوڕی شەعبە پێی وت: سوێند بەخوا تەنانەت یەك وشە لەگفتوگۆکانی نێوان تۆ و یارانی شەبیب لەحەجاج نەشاردرایەوە بەڵکو بێ گومان دەنەوەندەی پێ زیاد دەکەن و حەجاجی لێ ئاگادار دەکەنەوە. ئەگەر لەناو هەورەکاندا بیت، حەجاج بەدواتا دەگەرێت و لەناوت دەبات. رابکە، رابکە!

هاورێکانی بۆچونەکەی ئەویان پشت راست کردەوە. ئەو لەمەداین هاتەدەر و بەرەو کوێستانەکان بەرێکەوت. قەبیصە کوڕی عەبدولرەحمانی خەسعەمی لەخانەقای یەزدگێرد چاوی پێی کەوت و بەچاکە هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد و جل و بەرگ و خەرجی پێ بەخشی و هاورێیەتی کرد و دواتر گەرایەوە. دواتر موتەریف لەدەسکەرە، هاورێکانی لە مەبەستەکەی ئاگادار کردەوە. داوای شوێنکەوتن و لایەنگری کردنی لێکردن. مەبەستی ئەو لەسەر کار لابردنی عەبدولەلیك و حەجاج و پێشنیاری گەرانەوەی خەڵك بۆ نوسراوی خواوەند وشێوازی پێغەمبەر و سپاردنی کاری

فەرمانڕەوایی موسوڵمانان بەشۆرای ئەوان بو تا هەر کەسێك کەپەسەندی دەکەن، وەك ڕێبەری خۆیان هەڵیبژێرن. دەستەیەك لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەتیان لەگەڵ کرد و دەستەیەك گەڕانەوە.

یەکێك لەو کەسانەی ئەویان بەجێهێشت، سەبرە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف بو کە هاتە لای حەجاج و هاورێ لەگەڵ خەڵکانی شام لەگەڵ شەبیب شەڕی کرد.

موتەریف بەرەو حیلوان بەرێکەوت کەسومید کوڕی عەبدولرەحمانی سەعدی بەنوێنەرایەتی حەجاج فەرمانداری ئەو سەرزەمینە بو. ئەو و کوردەکان بڕیاریاندا ڕێگەی ئەم کارەی لێبگرن تا لای حەجاج بەڵگەیەکی شیاوی ڕازی بونیان هەبێت. موتەریف (بەهاودەستی نهێنی ئەو) لەسنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو تێپەڕی و هێرشی کردە سەر کوردەکان و کەسانێکی لەوان کوشت و بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە هەمەدان (کەبراکەی حەمزە کوڕی موغەیرە لەوێ بو) ئەوێی بەجێهێشت و مەبەستی ڕۆشتن بۆ مانگ دیناری کرد و نامەی بۆ حەمزەی برای نوسی و داوای سامان و کەرەستەی شەڕی لێکرد. حەمزە بەشێوەیەکی نهێنی سامان و کەرەستەی شەڕی بۆ ڕەوانە کرد. موتەریف بەرێکەوت تا گەیشتە قوم و کاشان و کارگوزارەکانی خۆی بۆ ئەو ناوچانە ڕەوانە کرد. خەڵك لەدەوری کۆبونەوە. لەناو ئەو کەسانەی لەدەوری ئەو کۆبونەوە، ئەم دو کەسە دەبینران: سومید کوڕی سێرحانی سەقەفی و بوکەیر کوڕی هارونی نەخەعی لەشاری ڕەی هاورێ لەگەڵ پێنسەد پیاوی شەڕکەر.

بەرا عبرای قەبیصە فەرمانداری ئیسفەهان بەنوێنەرایەتی حەجاج، نامەی بۆ نوسی و لەکاروبارەکانی موتەریف ئاگاداری کردەوە و داوای هاوکاری لێکرد. حەجاج بەئەسپە تایبەتەکانی پەیك و پەیام بردن، بەردەوام خەڵکانی بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە دەکرد. حەجاج بۆ عودەی کوڕی زیاد، کارگوزاری خۆی لەناوچەی ڕەی نامەی نوسی و فەرمانی پێدا ڕەوانە ببێت و لەگەڵ بەرا ء بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موتەریف یەك بگرێت. عودەی لەرەی وە بەرێکەوت و لەگەڵ بەرا ءکوڕی قەبیصە بۆ شەڕ لەگەڵ موتەریف یەکیان گرت. عودەی فەرماندە بو. ئەوان شەش هەزار پیاوی شەڕکەریان بۆ شەڕ لەگەڵ موتەریف ئامادە کرد. حەمزە کوڕی موغەیرە نامەی بۆ حەجاج نوسی و لەهاورێیەتی

ئەم سوپایە خۆی بەدور گرت و داوای بەخشینی کرد. حەجاج وای نیشاندا بەو کارە رازی بوە، بەڵام لەدڵدا مەبەستی ئەوەی کرد حەمزە لەسەر کار لاببات بەڵام ترسا کە حەمزەیش وەك براکەی شۆڕش دەست پێ بکات. بۆ قەیس کوڕی سەعدی عێجلی، سەرکردەی پاسەوانەکانی حەمزە لەهەمەدان نامەی نوسی و ئەوی کردە فەرمانداری ئەم شارە و فەرمانی پێدا حەمزە زیندانی بکات.

لەهەمەدان هۆزەکانی عێجل و رەبیعە خەڵکانێکی فراوان بون. قەیس کوڕی سەعد لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەخەڵکەکەی ڕۆشتە لای حەمزە و نامەکەی حەجاجی سەبارەت بەفەرمانداری خۆی نیشاندا کەدەیوت: دەبێت حەمزە کوڕی موغەیرە زیندانی بکەیت. قەیس حەمزەی گرت و خستیە زیندان و خۆی فەرمانداری هەمەدانی گرتە دەست. حەجاج لەم لایەنەوە ئاسودە بو چونکە بەبونی حەمزە لەهەمەدان دەترسا لەوەی بەنهێنی سامان و کەرەستەی شەڕ و بەئەگەری زۆر پیاوە شەڕکەرەکان بۆ براکەی رەوانە بکات.

کاتێك ئەوی زیندانی کرد، دڵی ئاسودەبو و ئەندێشەی ئارام بویەوە. کاتێك عودەی کوڕی زیاد و بەرا عکوڕی قەبیصە کۆبونەوە، بۆ پەیوەست بوون بەموتەریف بەرێکەوتن و لەدەوری ئەو سەنگەریان هەڵکەند. کاتێك لێی نزیك کەوتنەوە، بۆ شەڕ ریزیان بەست و بەسەختی شەڕیان کرد. هاوەڵانی موتەریف رایان کرد و خۆی کوژرا و دەستەیەکی فراوان لەهاوەڵانی کوشتار کران. ئەو بەدەستی عومەیر کوڕی هوبەیرەی فەزاری کوژرا وسەرەکەی هەڵگرت و بەم کارەی لای ئومەوییەکان پێگەی بەرز بویەوە. کوڕی هوبەیرە لەو رۆژەدا ئازایانە شەڕی دەکرد.

یەزید کوڕی ئەبی زیاد کۆیلەکەی موغەیرە کوژرا. ئەو ئاڵا هەڵگری موتەریف بو. لەیارانی ئەو عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله کوڕی عەفیفی ئەزدی کەپیاوێکی خۆپارێز و خواپەرەست، بو کوژرا.

عودەی کوڕی زیاد، ئەو کەسانەی ئازایانە شەڕیان کردبوو، بۆ لای حەجاجی ناردن کەرێزی لێگرتن. عودەی ئەمانی بەبوکەیر کوڕی هارون و سوەید کوڕی سێرحان ئەمانی بەخشی. داوای ئەمانیان بۆ حەجاج کوڕی حارسەی خەسعەمی کرد. ئەو نامەی حەجاجی بۆ ئەوان رەوانە کرد کە فەرمانی دەدا ئەگەر (زیندو بێت) بۆ لای ئەو

ڕەوانەی بکەن. کوڕی حارسە خۆی شاردەوە تا عودەی لەسەر کار لابرا. دواتر لەکاتی فەرمانداری خالید کوڕی عەتاب کوڕی وەرقا ەدوبارە خۆی ئاشکرا کرد.

حەجاج بەردەوام دەیوت: موتەریف، زادەی موغەیرە کوڕی شەعبە نیە، کوڕی مەصقەلە کوڕی سەبرەی شەیبانیە. ئەم دوانە هەردوکیان منالّەکەیان بۆ خۆیان دەگەڕاندەوە. موتەریف بو بەکوڕی موغەیرە و قامچیان لەمەصقەلەدا. کاتێك ئەندێشەی خەواریج ئاشکرا بو، حەجاج ئەم قسەی هێنایە سەرزمان چونکە بەشی زۆری خەواریج لەخەڵکانی ڕەبیعە بون و هیچ کام لەخەڵکانی قەیسی عەیلان لەناو ئەواندا نەدەبینران.

## دوبەرەکی لەنێوان ئەزرەقیەکان

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەموهەلیب بۆ شەڕی ئەزرەقیەکان ڕەوانە بو و لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد تا عەتاب کوڕی وەرقا ی ڕیاحی لێی جیابویەوە و بۆ لای حەجاج گەڕایەوە. دوای ئەوەی عەتاب لەموهەلیب جیابویەوە، ئەو لەشەڕ کردن لەگەڵ خەواریج بەردەوام بو و لەناو ئەو شەڕانە بۆ ماوەیەك یەك ساڵ لەشاپوور بەسەختی شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد. دواتر ئەو لە شەڕی (بستان) پێشڕەوی کرد و لەگەڵ ئەوان جەنگا. کرمان لەدەستی خواریجدا بو و پارس لەدەستی موهەلیب. خەواریج شوێنەکەی خۆیان بەتەنگ و دژوار زانی چونکە هۆکارەکانی بژێوی لەپارسەوە نەدەگەیشتە ئەوان. لەبەر ئەمە هاتنەدەر و ڕۆشتنە کرمان و موهەلیب شوێنپێی ئەوانی هەڵگرت تا لەجیرۆفت دابەزی و شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد. کاتێك سەراسەری پارس کەوتە دەستی موهەلیب، حەجاج کارگوزارەکانی خۆی بۆ پانتاییەکانی ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد و نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی کەنەسا، دارابگەرد و شاری ئیستەخر بخاتە بەردەست موهەلیب بۆ ئەوەی پشتیوانی ئەو لەشەڕەکانی بێت. عەبدولمەلیك ئەو شارانەی بەموهەلیب سپارد. حەجاج، بەرا ءکوڕی قەبیصەی بۆ لای موهەلیب ڕەوانە کرد تا بۆ شەڕ دژی خەواریج هانی بدات بەشێوەیەك موهەلیب نەتوانێت هیچ بەڵگە و پاساوێك بێنێتەوە.

موهەلیب هاوڕێ لەگەڵ سوپاییەکان هاتەدەر و لەنوێژی بەیانی تا نوێژی نیمەڕۆ لەگەڵ خەواریج شەڕی کرد و دواتر گەڕایەوە و بەرا ءلەبەرزاییەوە سەیری ئەوانی دەکرد. ڕۆشتە لای موهەلیب و وتی: من دەستەیەکی شەڕکەر و سوارانی ئازاتر و

خۆڕاگرتر لەسوارە شەڕکەرەکانی تۆم نەبینیوە. دواتر موهەلیب لەکاتی نوێژی نێوارێ گەڕایەوە و هاوشێوەی جاری پێشو شەڕی لەگەڵ ئەوان دەسپێکرد بەشێوەیەك هیچ دەستەیەك لەدەستەکەیتر جیا نەدەبویەوە. دەستەیەك لەدەستەکانی خەواریج بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دەستەیەك شەڕکەری موهەلیب هاتەدەر و شەڕ لەنێوان ئەوان روی لەدژواری کرد تا ئەوەی شەو داهات و دیوارێکی ڕەشی لەنێوان ئەواندا دروست کرد. یەکێك لەم دوانە بەویتری وت: ئێوە کێن؟ ئەوان وتیان: لەبەنی تەمیمین. ئەوانیش وتیان: ئێمەیش لەمنالەکانی بەنی تەمیمین. لەکاتی شەو لەیەك جیابونەوە. موهەلیب بە بەرا عکوری قەبیصەی وت: ئەم خەڵکەت چۆن بینی؟ جگە لەخوای گەورە کەس تۆی بەسەر ئەواندا سەرکەوتو نەکرد. موهەلیب چاکەی لەگەڵ بەرا ءکرد و فەرمانیدا دەهەزار درەم دیاریان پێدا. بەرا ءبۆ لای حەجاج گەڕایەوە و بەڵگە و پاساوکەی موهەلیبی پشت ڕاست کردەوە.

موهەلیب بۆ ماوەی هەژدە مانگ شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. یەکێك لەکارگوزارانی قەتەری لەسنوری کرمان (بەناو و نیشانی موقەعتەری زەببی) پیاوێکی لەوان کوشت. خەواریج رویان کردە قەتەری و داوای خوێنباییان لێکرد. ئەو نەیکرد و وتی: ئەو (تأویلی)( گەڕاندنەوە یا هەڵگەڕانەوە لە شتێك یا کارێك) کردوە و لەم کارەدا ڕێگەی ناراستی گرتۆتەبەر. بۆچونی من کوشتنی ئەو نیە چونکە ئەو یەکێکە لەخاوەنانی لەپێشی لەناو ئێوەدا. لێرەوە دوبەرەکی لەناویاندا دروست بو.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری دوبەرەکی ئەوان ئەوە بو کە لەناو سوپای خەواریج پیاوێکی دەست ڕەنگین بو کە تیری ژەهراوی دروست دەکرد و سوپاکەی موهەلیبی بەو تیرانە تیرباران دەکرد. هاوەڵانی موهەلیب سکاڵایان لەم کارە کرد. وتی: زیانی ئەولەئێوە دور دەخەمەوە. دواتر پیاوێکی خۆی بەنامەیەك بۆ ناو سوپاکەی قەتەری ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا نامەکە (بەشێوەیەك کەس نەیبینێت) فرێبداتە ناو سوپاکەی ئەو. ئەم کارەی کرد و نامەکە بەدەست قەتەری گەیشت و بینی تیایدا نوسراوە: دوای سڵاو، تیرەکانی تۆ گەیشتن و من هەزار درەمم بۆ تۆ ڕەوانە کرد. قەتەری ئەو پیاوەی بانگ کرد و پیاو حاشای لەو کارە کرد (کە لەگەڵ دوژمندا پەیوەندی هەبێت) قەتەری ئەوی

گوشت و عەبد ڕەببەی گەورە بۆ ئەم کارەی ڕەخنەی لێگرت و لێرەوە دوبەرەکی لەناو ئەواندا دروست بو. دواتر موهەلیب فەرمانی بەپیاوێکی مەسیحیدا بڕواتە لای قەتەری و کوڕنوشی بۆ ببات و لەبەرابەر ئەو سەر لەزەوی بدات. ئەم کارەی کرد. خەواریج وتیان: ئەم پیاوە تۆی وەك خوا هەڵبژاردوە. یەکێك لەوان هێرشی کردە سەر پیاوی مەسیحی و خوێنی ڕشت. کەلێنی نێوان ئەوان زیاتر تەشەنەی سەند و دەستەیەك لەوان لەقەتەری جیابونەوە. عەبد ڕەببەی گەورەیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد و قەتەریان لەسەر کار لابرد. یەك لەسەر چوار یا پێنجی ئەوان لەگەڵ قەتەری مانەوە. ئەوان بۆ ماوەی یەك مانگ لەناو خۆیاندا کوشتاریان کرد.

موهەلیب هەواڵی ئەم کارەی بۆ حەجاج نوسی. حەجاج نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا لەگەرماوگەرمی دوبەرەکی ئەوان هێرشیان بکاتەسەر پێش ئەوەی کۆببنەوە و لەسەر کارێك ڕێکبکەون. موهەلیب نوسی: ئێستا کە سەرقاڵی کوشتاری یەکترن، من شەڕکردن لەگەڵ ئەوانم پێ باش نیە. ئەگەر لەسەر دوبەرەکی بەردەوام بن، ئەوە دەبێت کە ئێمە خوازیارین پێی چونکە لەناو چونی ئەوان لەم ڕێگەوە ئەگەری دەبێت. ئەگەر لەسەر کارێك کۆك بون، دوای ئەوە دەبێت کە بەسەختی یەکیان کوشتار و سەرکوت کردوە و لەو کاتەدا من هێرش دەکەمە سەر ئەوان چونکە لەهەر کاتێکیتر ڕیسواتر و لاوازترن. ئەمە بەخواستی خوای گەورەیە. ماڵئاوا. حەجاج لەبەرابەر ئەو بێدەنگی هەڵبژارد. موهەلیب بۆ ماوەی یەك مانگ دەستی لەوان هەڵگرت کە سەرقاڵی کوشتاری یەك بون. دواتر قەتەری لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی بۆ تەبەرستان کۆچی کرد و پاشماوەکان لەگەڵ عەبد ڕەببەی گەورە بەیعەتیان کرد.

## کوژرانی عەبد ڕەببەی گەورە

کاتێك قەتەری بەرەو تەبەرستان ڕۆشت، عەبد ڕەببە لەکرمان مایەوە. موهەلیب هێرشی کردە سەر ئەوان و بەسەختی شەڕی یەکیان کرد. لەجیرۆفت گەمارۆی خستە سەر ئەوان و بەردەوام شەڕی لەگەڵ ئەوان دەکرد بەلام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. دواتر ئاڵقەی گەمارۆکە زەختی خستە سەر خەواریج و ئەوان هاورێ لەگەڵ ژن و سامانەکانی خۆیان جیرۆفتیان بەجێهێشت. موهەلیب پیاوانە شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد تا ئەوەی ئەسپەکان لەناوچون و شمشێرەکان شکان و سوارەکان کوژران. دەستبەرداری

ئەوان بو کە رەوانە بون. موهەلیب ڕۆشتە ناو جیرۆفت و دواتر شوێن پێی ئەوانی هەلگرت تا ئەوەی لەچوار فەرسەخی جیرۆفت روبەروی یەك بونەوە و شەرێکی قورسیان دەست پێکردەوە. لەبەرەبەیانەوە تا نیمەڕۆ شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و دواتر لای ئەوان نیشتەجێ بو.

ئەوسا عەبد رەببە هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و وتی: ئەی دەستەی موهاجیرەکان! قەتەری و هاورێکانی بەهیوایی ژیانێکی درێژتر رایان کرد و ئێستا رێگەیەك بۆ گەیشتن بە قەتەری و هاوەڵانی نیە. روبەروی دوژمن ببنەوە و گیانی خۆتان لەرێگەی خوادا ببەخشن. دواتر بۆ گۆڕەپانی شەڕ گەڕایەوە. بەشێوەیەك شەڕیان کرد کە شەڕەکانی پێشویان بیرچویەوە. تەنانەت دەستەیەك لەسوپاکەی موهەلیب لەگەڵ یەکتر پەیمانی مەرگیان بەست. خەواریج دابەزین و ئەسپەکانی خۆیان کوشت و شەڕ روی لەدژواری کرد بەرادەیەك کە موهەلیب وتی: هەرگیز رۆژێکی هاوشێوەی ئەوەم نەبینیوە. دواتر خوای گەورە خۆڕاگری کردە بەشی موهەلیب و سوپاکەی و خەواریج شکستیان خوارد و هەڵاتن و زۆر لەوان کوژران. یەکێك لەکوژراوەکان عەبد رەببە بو. ژمارەی کوژراوەکان بەچوار هەزار کەس خەملێنرا و تەنیا دەستەیەکی کەم رزگاریان بو. لەشکرگەکەی ئەوانیان تاڵان کرد و ژنانیان کردە ئەسیر چونکە ئەوان ژنانی موسوڵمانیان بەئەسیری دەگرت. توفەیل کوڕی عامر کوڕی واسیلە سەبارەت بەکوژرانی عەبد رەببە و هاوەڵانی وتی:

| | |
|---|---|
| لقد مس منا عبد رب و جنده | عقاب فامسی سبیهم فی المقاسم |
| سما لهم بالجیش حتی ازاحهم | بکرمان عن مثوی من الارض ناعم |
| و ما قطری الکفر الا نعامة | طرید یدوی لیله غیر نائم |
| اذا فر منا هاربا کان وجهه | طریقاسوی قصد الهدی و الکعالم |
| فلیس بمنجیه الفرار و ان جرت | به الفلك فی لج من البحر دائم |

یانی: لەلایەن ئێمەوە سزایەك بەعەبد رەببە و سوپاکەی گەیشت و ئەمە ژنەکانی ئەوانن بەئەسیری گیراون و لەنێوان ئەم و ئەو دابەش دەکرێن. فەرماندەکەی ئێمە بەسوپا بێ کۆتاییەکەی خۆی هێرشی کردە سەر ئەوان تا ئەوان لەکرمان، لەسەرزەمینێکی ئاسودە لەسەر زەوی، دەرپەڕێنێت. قەتەری ناباوەڕ جگە لەوشتر مر

هیچ نیه کە لەهەمو شوێنێك دەرکراوە و شەوانە هاوار دەکات و خەوی لێ ناکەوێت. کاتێك لەئێمە هەڵبێت، رودەکاتە رێگەیەك کە نیشانەکانی راستی و دروستی لێوە نابینرێت. هەڵاتن ناتوانێت ئەو رزگار بکات هەرچەندە کەشتیەکان بەردەوام ئەو لەدەریایی بێ کۆتایی لەم بەستێن بۆ ئەو بەستێن ببەن.

دێرەکانی ئەم قەسیدەیە زیاتر لەمەیە. ئاماژەمان پێنەدا چونکە هەموان دەیزانن.

حەجاج بەخششی بەشەرکەر رەنج دیتوەکان بەخشی و بەخششەکانی ئەوانی زیاد کرد. موهەلیب مژدەبەرێکی بۆ لای حەجاج رەوانە کرد. کاتێك گەیشت، سەبارەت بە سوپا و خەواریج و شەڕەکانیان و چۆنیەتی کارەکانی موهەلیب، حەجاجی ئاگادار کردەوە. وتی: موغەیرە سوارکار و سەروەریانە. یەزید باشترین شەڕکەری سوارکارە. بەخشندە و دەست بڵاویان قەبیصەیە، ئازا شەرم ناکات لەمەدرەکە رابکات، عەبدولمەلیك ژەهرێکی کوشەندەیە، حەبیب مەرگێکی لەناکاوە، محەممەد شێری دارستانە و مەفزەل بەهێز و دلێرە. حەجاج وتی: کامیان لەهەموان زیاتر سود و کاریگەری بو؟ مژدەدەر وتی: ئەوان وەك ئاڵقەیەك دروست کراون کە هەردو لاکەی زانراو نیە. حەجاج قسەکەی ئەوی پەسەند کرد و نامەی بۆ موهەلیب نوسی و سوپاس و دەسخۆشی لێکرد و فەرمانی پێدا کەسێك بکاتە فەرمانڕەوای کرمان کە جێی باوەڕ بێت و لەوێ سوپایەکی بۆ ئامادە بکات تا لەکاتی پێویست هاوکاری بکەن. ئەو کوڕەکەی یەزیدی وەك فەرمانداری کرمان دەست نیشان کرد و خۆی بۆ لای حەجاج بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە لای حەجاج، رێزی لێگرت و لای خۆی لەسەر تەخت داینیشاند و وتی: ئەی عێراقیەکان، ئێوە کۆیلەکانی موهەلیبن. دواتر وتی: تۆ بەو شێوەییت کە لەقیت کوڕی یەعمەری ئەیادی بۆ وەسف کردنی فەرماندەی سوپاکان وتویەتی:

| | |
|---|---|
| و قلدوا امركم لله دركم | رحب الذراع بامر الحرب مضطلعا |
| لامترفا ان رخا ء العيش ساعده | و لا اذا عض مكروة به خشعا |
| مسهد النوم تعينيه ثغوركم | يروم منها الى الاعداء مطلعا |
| ما انفك يحلب هذا الدهر اشطرة | يكون متبعا طورا و متسعا |
| و ليس يشغله مال يثمره | عنكم و لا ولد يبغى له الرفعا |
| حتى استمرت علا شزر مريرته | مستحكم السن لا قحما و لا ضرعا |

یانی: خوا چاکەتان لەگەڵ بکات، کاروبارتان بەپیاوێك سپارد دەست کراوە و شارەزا لەکاروباری جەنگ. نە بەزێدەڕۆیی خەرج دەکات ئەگەر فراوانی ژیان بەدەست بێنێت و نەکاتێك زیانی بەردەکەوێت، پشتی دەشکێت (یا دەچەمێتەوە). خەوێکی سوکی هەیە و بیر لەسنورەکانی ئێوە دەکاتەوە کەبەردەوام وشیارانە لەسنورەکانەوە هێرش دەکاتە سەر دوژمنان. ئەم رۆژگارە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەوی کردۆتە کەسێکی بەئەزمون، هەندێ کات سەروەری و سەردار و هەندێ کات بەخشەرێك کە بەخەروار دەبەخشێت. نە بەسامانەوە سەرقاڵ دەبێت تا سودی زیاتر بەدەست بێنێت و نە مناڵێك کە خوازیاری سەروەری و گەورەیی بۆ ئەو بێت. سەرئەنجام سرشتی بۆ سەرسەختی بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە، دانەکانی بەهێزی هەبێت، نە بەتەمەن و گوێی لەتەنیشت قەبرا بلەرزێت نە دەستەمۆ و ریسوا و لاواز.

## کوژرانی قەتەری کوڕی فوجائەت و عوبەیدە کوڕی هیلال

لەم ساڵەدا قەتەری و عوبەیدە کوڕی هیلال و ئەو ئەزرەقیانەی لەگەڵ ئەوان بون، لەناوچون.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك دوبەرەکی لەناو ئەواندا بوە هۆکاری بڵاوبونەوە و لەناوچونی ئەوان، قەتەری رویکردە تەبەرستان. ئەم هەواڵە بەحەجاج گەیشت کەسوفیان کوڕی ئەبرەدی بەسوپایەکی گەورە بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد. سوفیان بەرێکەوت و ئیسحاق کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس هاورێ لەگەڵ سوپایەك لەخەڵکانی کوفە لەتەبەرستان هاورێیەتی ئەوی کرد. ئەوان بەدوای قەتەریدا گەڕان و لەدۆڵێك لەدۆڵەکانی تەبەرستان ئەویان دۆزیەوە. هاوەڵانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد و ئەو لەئەسپەکەی بۆ ناو قوڵایی دۆڵەکە کەوتەخوار. پیاوێکی چوارشانەی ئەستور لەخەڵکانی ئەوشارە ڕۆشتە سەر سەری. قەتەری پێی وت: کەمێك ئاوم پێ بدە. پیاوەکە وتی: شتێکم پێ بدە. قەتەری وتی: جگە لەکەرەستەی شەڕ هیچم نیە و کاتێك ئاوەکەت بۆ هێنام پێت دەدەم. پیاوەکە ڕۆشت تا گەشتە بەرزاییەك لەسەر سەری قەتەری و لەوێوە بەردێکی تلێر کردەوە کە بەر رانی قەتەری کەوت و شکاندی. لەتاو ئازار هاواری کرد و خەڵك رویان تێکرد. پیاوەکە ئەوی نەناسیەوە بەڵام چونکە کەرەستەی شەڕی پێبو و روخسارێکی جوانی بو، بەکەسێکی گەورەی زانی. چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە هاتن و

ئەویان کوشت. ئەم کەسانە بون: سورە کوڕی حوڕی تەمیمی، جەعفەر کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی مێخنەف، صەباح کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس، بازان کۆیلەی ئەوان و عومەر کوڕی ئەبی صەڵت. هەمویان دەیانوت من قەتەریم کوشتوە.

کوڕی ئەبوجەهم کوڕی کەنانە هاتە لای ئەوان و وتی: سەری ئەو بەمن بسپێرن و ئاشتی بکەن. سەری ئەوی هەڵگرت و بردیە لای ئیسحاق کوڕی محەممەد کە ئەویش ڕەوانەی سوفیانی کرد و سوفیان سەری قەتەری بە ئەبوجەهم بۆ حەجاج ڕەوانە کرد و حەجاجیش بۆ لای عەبدولمەلیک. عەبدولمەلیک دو هەزار درەمی پێ بەخشی.

دواتر سوفیان گەڕایەوە و گەمارۆی خستە سەر ئەوان و فەرمانی بەجارچیەکدا کەجاڕیدا: هەر کەس هاوڕێ یا سەروەری خۆی بکوژێت وبۆ لای ئێمە بێت، ئەمانی پێ دەبەخشرێت. عوبەیدە کوڕی هیلال لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| لعمری لقد قام الاصم بخطبة | لذی الشك منها فی الصدور غلیل |
| لعمری لان اعطیت سفیان بیعتی | و فارقت دینی اننی لجهول |
| الی الله اشکو ما نری بجیادنا | تساوك هزلی مخهن قلیل |
| تعاورها القذاف من کل جانب | بقومس حتی صعبهن ذلیل |
| فان تك افناها الحصار فربما | تشحط فما بینهن قتیل |
| و قد کن مما ان یقدن علی الوجی | لهن بابواب القباب صهیل |

یانی: سوێند بەگیانی خۆم پیاوی کەڕ و لاڵ کارو گوناحێکی گەورەی کرد کە گوماندار خرۆشانێك لەناو سینەیدا دروست دەبێت. سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر بەیعەتی خۆم بەسوفیان ببەخشم و دەست لەدینەکەی خۆم هەڵگیرم، بێ گومان پیاوێکی نەزانم. سکاڵا بۆ دەرگای خوا دەبەم کە ئەسپە ڕەسنەکانی ئێمە چیان بەسەر هاتوە. دواکەوتنی ناوقەد باریکەکانی هەڵبژێردراوەکانیان کەمە. تیرهاوێژەکان لەقومس لەهەر لایەکەوە گەمارۆیان خستنە سەر بەشێوەیەك سەرکێش و یاخی ئەوان دەستەمۆ بو. ئەگەر ئاڵقەی گەمارۆ ئەوانی لەناو بردبێت، کوژراوانی زۆر لەناو ئەوان لەخوێنی خۆیدا پەلەقاژەی کردوە. ئەگەر لەکاتێك کە سمی ئەسپەکانیان سواوە، بەم لاولایاندا ببەن، ئەوان لەخێوەتەکان حیلەیەکی جەرگ قەڵشێنیان هەیە.

سوفیان بەرادەیەك لەسەر گەمارۆدانی ئەوان پێداگری کرد کە چوارپێکانی خۆیان

خوارد و دواتر هاتنەدەر و شەڕیان دەست پێکرد. سوفیان هەموویانی کوشت و سەری براوی ئەوانی بۆ حەجاج رەوانە کرد. دواتر سوفیان ڕۆشتە دۆنباوەند و تەبەرستان و لەوێ مایەوە تا ئەوەی حەجاج پێش شەڕی جەماجیم ئەوی لەسەر کار لابرد.

دەستەیەك لەمێژوونوسان دەڵێن: دوای کوژرانی قەتەری و عوبەیدە ئەزرەقیەکان لەناوچون. ئەوان دەستەیەکی فراوان و پەیوەستی یەك بون و تەنیا یەك سوپایان هەبو. یەکەم سەرەوەری ئەوان نافیع کوڕی ئەزرەق بو و دوایین کەسیان قەتەری و عوبەیدە. بۆ ماوەی بیست وچەند ساڵ مانەوە. بەڵام من گومانم لەراستی ئەم قسە هەیە چونکە صوبەیحی مازنی تەمیمی موالی سوار کوڕی ئەشعەر لەرۆژگاری هشام هاتەدەر. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەئەزرەقیەکان یا صوفریەکان بو بەڵام رۆژگاری ئەو درێژ نەبویەوە و ماوەیەك دوای بزوتنەوەکەی کوژرا.

## کوژرانی بوکەیر کوڕی وەساج

لەم ساڵەدا ئومەییە کوڕی خالید کوڕی ئەسید کوڕی ئەبی ئەلاعەیص کوڕی ئومەییە، بوکەیر کوڕی وەساجی کوشت.

بەمشێوە بوکە، ئومەییە کوڕی عەبداللە( فەرمانداری عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەخوراسان) فەرمانی بەبوکەیردا هێزەکانی خۆی بۆ شەڕ لە (ماورالنهر) ئامادە بکات. پێشتر ئەوی وەك فەرمانداری تەخارستان دیاری کردبو. ئەو خۆی بۆ ڕۆشتن ئامادە کرد بەڵام بوحەیر کوڕی وەرقا ءلای ئومەییە خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان و ئومەییە ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرت. کاتێك فەرمانی پێدا بۆ ڕۆشتن بۆ ماوەرا ئەلنەهر ئامادە بێت، ئەو سامانێکی زۆری بۆ ئامادە کردنی هێزەکانی خۆی خەرج بەشێوەیەك کەقەرزار بو. بوحەیر بەئومەییەی وت: ئەگەر روبار جیایی لەنێوان تۆ و ئەو دروست بکات، خەلیفە لەسەر کار لادەبات. ئومەییە پەیامی بۆ ناردکە: بمێنەرەوە ئەگەری هەیە من بۆ شەڕ بڕۆم و تۆ لەگەڵ مندا بیت. بوکەیر توڕە بو و وتی: دەڵێی ماملە لەگەڵ من دەکات. هەروەها عوقاب زونەلقوە سامانی بەقەرز وەرگرتبو تا لەگەڵ بوکەیر بڕوات (و سەد بەرابەری ئەوەی بەقەرز وەریگرتوە تاڵانی بەدەست بێنێت). خاوەن قەرزەکان ئەویان گرت و خستیانە زیندان تا بوکەیر قەرزەکەی بۆ دایەوە.

دواتر ئومەییە خۆی بۆ ڕۆشتن بۆ شەر لەبوخارا ئامادە کرد تا لەوێوە بۆ لای موسا

کوڕی عەبدالله کوڕی خازم لەتەرموز بگەڕێتەوە. خەڵك خۆیان ئامادە کرد و بوکەیر هاوڕێیەتی ئەوانی کرد. بەڕێکەوتن و کاتێك گەیشتنە روبار و ویستیان بپەڕێنەوە، ئومەییە بەبوکەیری وت: من کوڕەکەم کرۆدتە فەرمانداری خوراسان و دەترسم نەتوانێت بەباشی کاروبارەکان راپەڕێنێت چونکە گەنجێکی تازە پێگەیشتوە. تۆ بۆ مەرو بگەڕێرەوە و کاروبارەکان بۆ من سامان ببەخشە چونکە بۆ ئەو کارە دەست نیشانم کردی تا کاروبارەکانی کوڕەکەم بەهێز و سەقامگیر بکەیت.

بوکەیر چەندین سواری هەڵبژارد کەپێشتر ئەوانی دەناسی و بڕوای پێیان بو. ئومەییە بۆ شەڕ روی لەبوخارا کرد. عوقاب زونەلقوە بەبوکەیری وت: ئێمە بەدوای فەرمانداریك لەقوڕەیش دەگەڕاین بەڵام کەسێك بو بەفەرمانداری ئێمە کە گەمەمان لەگەڵ دەکات و لەزیندانێکەوە بۆ زیندانێکیترمان دەبات. بۆچونی من ئەوەیە ئەم کەشتیانە بسوتێنیت و بۆ مەرو بڕۆین و ئومەییە لەسەر کار لابەرین و لەوێ بمێنینەوە وبۆ رۆژگارێك بەسازی دڵی خۆمان رابوێرین. ئەحنەف کوڕی عەبدالله عەنبەری وتارەکەی عوقابی پشت راست کردەوە. بوکەیر وتی: دەترسم ئەو سوارانەی لەگەڵ منن، لەناو بچن. وتی: ئەگەر ئەوان لەناو بچن، من لەخەڵکانی مەرو، هەرچەندە سوارکارت بوێت، کۆی دەکەمەوە. وتی: موسوڵمانان لەناو دەچن. وتی: ئەوەندە بەسە فەرمان بەجارچیەك بدەیت جاربدات: هەرکەس باوەڕ بەئیسلام بێنێت، قورسایی باج لەسەر شانی ئەو هەڵدەگرین. لەم کاتەدا پەنجا هەزار پیاوی شەڕکەری گوێڕایەڵتر لەمان لەدەوری تۆ کۆدەبنەوە. وتی: ئومەییە لەگەڵ هاوەڵانی لەناو دەچن. وتی: بۆ لەناو دەچن؟ ئەوان بەئەندازەیەك هێز و کەرەستەی شەڕیانە هەیە کە دەتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن تا بگەنە چین! بوکەیر کەشتیەکانی سوتاند وبۆ مەرو گەڕایەوە و کوڕی ئومەییەی گرت وخستیە زیندان و ئومەییەی لەسەر کار لابرد.

ئەم هەواڵە بەئومەییە گەیشت. ئەو لەسەر بنەمای پێدانی پارەیەکی کەم لەگەڵ خەڵکی بوخارا ئاشتی کرد و گەڕایەوە و فەرمانیدا کەشتیەکان ئامادە بکەن. لەروباری پەڕیەوە و بیری خەڵکی هێنایەوە چەندە چاکەی لەگەڵ بوکەیر کردوە و ئێستا بەم شێوەیە وەڵامی چاکەکانی دەداتەوە و شۆڕش دەست پێدەکات. بەرەو مەرو بەڕێکەوت. موسا کوڕی عەبدالله کوڕی خازم ڕۆشتە لای ئەو. ئومەییە شەماس کوڕی دێساری هاورێ

لەگەڵ هەشسەد پیاوی شەڕکەر بۆ شەڕی بوکەیر ڕەوانە کرد. بوکەیر بەرێکەوت و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر و شکستیدا و فەرمانی بەهاوەڵانیدا هیچ یەك لەوان نەکوژن. ئەوان کەرەستەکانی شەڕیان لێوەردەگرتن و ئازادیان دەکردن. ئومەییە بەرێکەوت و سابت کوڕی قوتبەی وەك پێشەنگی خۆی ڕەوانە کرد و بوکەیر ڕوبەڕوی بویەوە و سابتی گرت و بڵاوەی بەسوپاکەی کرد و دواتر سابتی ئازاد کرد.

ئومەییە هات و بوکەیر شەڕی لەگەڵ کرد. ڕۆژێك سوپاکەی ئەوانی تێکشکاند و بوکەیر پارێزگاری لەشەڕکەران کرد. ڕۆژێکیتر ڕوبەڕوی یەك بونەوە و بەقورسی شەڕیان کرد. دواتر ڕۆژێکیتر ڕوبەڕوی یەك بونەوە و بوکەیر شمشێری لەناوچاوی سابت کوڕی قوتبەدا. حورەیس کوڕی قوتبە برای سابت هێرشی کردە سەر بوکەیر. بوکەیر پاشەکشێی کرد و هاوەڵانی بڵاوەیان لێکرد. حورەیس شوێن بوکەیر کەوت تا گەشتنە پردەکە. بانگی کرد: ئەی بوکەیر، دەتوانی بۆ کوێ بڕۆیت؟ بوکەیر گەڕایەوە. حورەیس شمشێری لەسەریدا کەخودەکەی شکاند و بەرسەری کەوت و زیانی پێگەیاند و کەوتە سەرزەوی. هاوەڵانی ئەویان گرت و بردیانەوە بۆ ناو شار. ئەوان بەردەوام شەڕیان لەگەڵ یەك دەکرد.

یارانی بوکەیر جل و بەرگی ڕەنگینی زەرد و سوریان لەبەر دەکرد و دادەنیشتن و گفتوگۆیان دەکرد و جارچییەکەی ئەوان جاریدەدا: هەرکەس تیرێك بهاوێژێت، سەری پیاوێك لەخەڵکەکەی بۆ ئەو ڕەوانە دەکەین. کەس تیری نەدەهاویشت.

بوکەیر ترسا ئەگەر گەمارۆکە درێژە بکێشێت، خەڵکان چیتر هاوکاری نەکەن. لەبەر ئەمە خوازیاری ئاشتی بون. یارانی ئومەییەیش ئەو داواکاریەیان پێ پەسەند بو. لەسەر ئەو بنەمایە ئاشتیان کرد کە ئومەییە چوارسەد هەزار درەم بەخاوەن قەرزەکانی بدات و ئەو بکاتە فەرمانداری هەر شارێك کەدەخوازێت و پارە بەهاورێکانی بدات و وتەکانی بوحەیر سەبارەت بەو بەکار نەبات و ئەگەر گومانی لا دروست بو، بۆ ماوەی چل ڕۆژ دەستی لێ هەڵبگرێت.

ئومەییە ڕۆشتە ناو شاری مەرو و بەڵێنەکانی سەبارەت بە بوکەیر بردەسەر و وەك جاران ڕێزی لێگرت و بیست هەزار درەمی بە عوقاب بەخشی.

دەستەیەك دەڵێن: بوکەیر، تا ڕوبارەکە هاورێیەتی ئومەییەی نەکرد چونکە

ئومەییە ئەوی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کردبو. کاتێك ئومەییە بەرێکەوت و گەیشتە روبار، ئەوی لەسەر کار لابرد. دواتر کاروبارەکان بەوە کۆتایی هات کەئاماژەمان پێدا.

ئومەییە پیاوێکی بەخشندە و دڵنەرم بو لەگەڵ ئەوەیشدا لای خوراسانیەکان رزا قورس. ئەو زیاد لەرادە خۆپەسەند و خۆویست بو و دەیوت: خوراسان تەنانەت بۆ چێشتخانەکەی من بەس نیە. ئومەییە بوحەیر لەفەرماندەیی کردنی پاسەوانەکانی لابرد و عەتا کوڕی ئەبی سایبی بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرد. ئومەییە خەڵکی ناچار بەدانی باج کرد و تەنگی پێ هەڵچنین. رۆژێك بوکەیر لەمزگەوت بو و خەڵك لەدەوری دانیشتبون و ئاماژەیان بەسەختگیریەکانی ئومەییە دەدا و سەرکۆنەیان کرد. بوحەیر و زێرار کوڕی حوصەین و عەبدالله کوڕی جاریە کوڕی قودامە لەمزگەوت بون. بوحەیر ئومەییەی لەم گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە. بوکەیر ئەوی بەدرۆزن ناوبرد. بوحەیر دەیوت: ئەمانە شایەتی دەدەن. موزاحیم کوڕی ئەبی موجەشەری سولەمی شایەتیدا کە ئەو گاڵتەی کردوە. ئومەییە دەستبەرداری بو.

دواتر بوحەیر رۆشتە لای ئومەییە و وتی: سوێند بەخوا بوکەیر داوای لێکردم شان بەشانی ئەو شەڕ بکەم بۆ ئەوەی تۆ لەسەر کار لابەرین و وتی: ئەگەر لەبەر رێزی تۆ نەدەبو، ئەم پیاوە قورەیشیەم دەکوشت و خوراسانم دەخوارد. ئومەییە ئەوی بەدرۆزن لەقەڵەمدا. دەستەیەك کە بوکەیر ئەوانی بەدوژمنی خۆی ناساند، شایەتیاندا. ئومەییە بوکەیر و بەدل و شەمردلی (برازاکانی بوکەیر) گرت و زیندانی کردن و دواتر فەرمانی کوشتنی بوکەیری بەیەکێك لەسەرکردەکانی سوپاکەی خۆیدا. هیچ کام لەوان رازی نەبون بوکەیر بکوژن. فەرمانی بەبوحەیر دا کە ئەوی کوشت و ئومەییە دوبرازاکەی کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا ئومەییە بۆ شەڕ لەروباری بەلّخ پەڕیەوە. گەمارۆیان خستە سەر بەشێوەیەك خۆی و سوپاکەی کەوتە تەنگانەوە. دواتر لەکاتێکدا لەسەر هەڵدێری لەناوچون پەلەقاژەیان دەکرد، رزگاریان بو وبۆ مەرو گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا ئەبان کوڕی عوسمان فەرمانداری مەدینە لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد.

حەجاج فەرمانڕەوای بەسرە و کوفە و لەخوراسان ئومەییە فەرمانڕەوایەتی دەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عەبدولەلیك لەهاویندا شەڕی کرد.

لەم ساڵەدا جابر کوڕی عەبداللە کوڕی عەمرۆی ئەنساری ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

## درێژەی رووداوەکان

لەم ساڵەدا زەید کوڕی خالیدی جوهەنی مرد کەسەبارەت بەمەرگی ئەو ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە.

عەبدولرەحمان کوڕی غەنەم ئەشعەر لەرۆژگاری جاهلی لەم ساڵەدا مرد. ئەو چاوی بە پێغەمبەر(د.خ) نەکەوتبو.

## روداوەکانی ساڵی حەفتا و شەشی کۆچی ( ٦٩٨ زایینی )

## لەسەر کار لابردنی ئومەییە کوڕی عەبداللە و فەرمانڕەوایی موهەلیب لەخوراسان

کاتێك حەجاج لەساڵی ٧٨/ ٦٩٧ زایینی عوبەیداللە کوڕی ئەبی بەکرەی وەك فەرمانداری سیستان دەستنیشان کرد، ئەو یەك ساڵ مایەوە و شەڕی نەکرد. رۆتبیل بەئاشتی رازی ببو و باجی دەدا و هەندێ کات لەدانی باج خۆی بەدور دەگرت.

حەجاج نامەی بۆ عوبەیداللە کوڕی ئەبی بەکر نوسی و فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ رۆتبیل بکات و نەگەڕێتەوە تا سەرزەمینەکانی ئەو بەسمی ئەسپەکانی خۆی پێشێل دەکات و قەڵاکانی خاپور و پیاوەکانی زیندانی بکات.

عوبەیداللە لەگەڵ خەڵکانی کوفە و بەسرە بەرێکەوت. فەرماندەی خەڵکانی کوفە، شورەیح کوڕی هانی لەهاوەڵانی عەلی بو. عوبەیداللە بەرێکەوت تا گەیشتە سەرزەمینی رۆتبیل و تا ئەو جێگەی دەیویست تاڵانی کرد و قەڵاکانی وێران کرد و دەستی بەسەر سەرزەمینەکانیدا گرت. هاوەڵانی رۆتبیل لەتورکەکان، سەرزەمینەکانیان یەك لەدوای یەك بەجێ دەهێشت بەشێوەیەك عوبەیداللە و سوپاکەی لەقوڵایی سەرزەمینەکەی ئەوان رۆشتنە پێش و لەپایتەختەکەیان نزیك کەوتنەوە. ئەوان لەهەژدە فەرسەخی پایتەختەکەیان بون. رێڕەو و دۆڵەکانیان لەموسوڵمانان گرت و موسوڵمانان شڵەژان و پەرێشان بون و گومانی ئەوەیان کرد کە هەمویان لەناو دەچن. عوبەیداللە لەسەردانی حەوتسەد هەزار درەم ئاشتی لەگەڵ کردن کە تەسلیمی رۆتبیلی کرد تا رێگە بدات لەسەرزەمینەکەی ئەو بڕۆنەدەر. شورەیح چاوی پێی کەوت و پێی وت: هەرچەندە ئاشتی بکەن پاشا لەبەخششەکانی ئێوە کەم دەکاتەوە. من رۆژگارێکی درێژم بەسەر بردوە و بەردەوام ئارەزوی گیان بەخشینم هەبوە و ئەگەر ئەمڕۆ گیان بەخشین لەدەستم بڕوات تا رۆژی مەرگ بەدەستی ناهێنم. دواتر شورەیح وتی: ئەی هاورێیان و یارانی ئیسلام، بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمنان هاوکاری یەك بکەن. کوڕی ئەبی بەکرە پێی وت: تۆ پیرێکی خڵەفاویت. شورەیح پێی وت: بۆ تۆ ئەوەندە بەسە کەدەڵێن: باخەکەی

عوبەیدالله و گەرماوەکەی عوبەیدالله. ئەی هاورێیانی ئیسلام، هەرکەس خوازیاری گیان بەخشینە، لای من کۆببێتەوە. دەستەیەك لەخوازیاران کەژمارەیان زۆر نەبو، لەدەوری کۆبونەوە. دەستەیەك لەخۆپارێزان و سوارەکانیش پەیوەستیان بون. ئەوان شەڕیان کرد تا هەمویان کوژران جگە لەدەستەیەکی کەم لەوان کە رزگاری بو. شورەیح سرودی شەڕی دەخوێند و دەیوت:

| | |
|---|---|
| اصبحت ذا بث اقاسی الکبرا | قد عشت بین المشرکین اعصرا |
| ثمة ادرکنا النبی المنذرا | و بعده صدیقه و عمرا |
| و یوم عمران و یوم تسترا | و الجمع فی صفینهم و النهرا |
| و باجمیرات مع المشقرا | هیهات ما اطول هذا عمرا |

یانی: بەردەوام خەمبارم و لەپیری رەنج دەکێشم. رۆژگارانێکم لەناو بتپەرستەکان بەسەر برد. دواتر چاومان بە پێغەمبەری وشیارکەر کەوت. دوای ئەو پیاوی راستگۆ و دوای ئەو عومەر. لەشەڕی عیمران بوم و شوشتەر و صەفین و نەهرەوان و باحمیرات هاورێ لەگەڵ مەشقەر. هاوار چەندە ژیانێکی درێژە!

ئەو شەڕی کرد تا هاورێ لەگەڵ کەسانێك لەهاوەڵانی کوژرا. دەستەیەکیش رزگاریان بو. دواتر لەسەرزەمینی رۆتبیل هاتنەدەر و خەڵك بەخۆراکی فراوان پێشوازیان لێکردن. هەرکام لەوان کاتێك خواردنی دەخوارد و تێردەبو، دەمرد. خەڵك وشیار بونەوە و بەهێواشی خواردنیان دەخوارد. کەمێك رۆنیان دەرخوارددان تا بۆ خواردن ئامادە بون. هەواڵی ئەم کارە بەحەجاج گەیشت. نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و لەچۆنیەتی ئەم روداوە ئاگاداری کردەوە و پێی راگەیاند سوپایەکی گەورەی لەخەڵکانی کوفە و بەسرەی بۆ شەڕ ئامادە کردوە و چاوەڕوانی فەرمانە تا بۆ شەڕی رۆتبیل رەوانەیان بکات.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا تاعونێکی دژوار یەخەی خەڵکی شامی گرت بەشێوەیەك ئەوەندەی نەمابو هەمویان لەناو بچن. بەوتەی دەستەیەك، لەبەر ئەمە کەس لەم ساڵەدا بۆ شەڕ نەڕۆشت.

هەروەها لەم ساڵەدا رۆمیەکان هێرشیان کردە سەر خەڵکانی ئەنتاکیە و بەسەر ئەواندا زاڵبون.

لەمساڵەدا شورەیح کوڕی حارس داوای کرد لەسەرپەرەستی دامەزراوی دادی کوفە دوری بخەنەوە. حەجاج بەداواکەی ڕازی بو و ئەبو بەردە کوڕی ئەبی موسای لەجێگەی ئەو دانا.

ئایینی حەج لەم ساڵەدا ئەبان کوڕی عوسمان فەرمانداری مەدینە، ئەنجامیدا.

سەراسەری عێراق و ڕۆژهەڵات زەمین لەژێر فەرمانڕەوایەتی حەجاجدا بو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە موسا کوڕی ئەنەس بو.

هەروەها لەم ساڵەدا مەحمود کوڕی ڕەبیع (نازناوەکەی باوکی ئیبراهیم) مرد. ئەو لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك ببو. هەروەها عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللە کوڕی مەسعودماڵئاوایی لەجیهان کرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی هەشتای کۆچی ( ٦٩٩ زایینی )

لەم ساڵەدا لافاوێك لەمەککە هەستا. لافاوەکە بەرادەیەك مەترسیدار بو کە وشترە بار قورسەکان و خەڵکانی لەگەڵ خۆی دەبرد و کەس رێگەچارەی نەدەزانی. زۆر لەماڵەکانی مەککە لەژێر ئاودا نوقم بون و لافاو تا شوێنی روکن بەرز بویەوە. لەبەر ئەمە ئەم ساڵەیان بە ساڵی (جحاف) (مەرگ یا لافاو) ناوبرد.

لەم ساڵەدا تاعونێکیماڵوێرانکەر لەبەسرە بڵاو بویەوە.

## شەڕی موهەلیب لەماوراءئەلنەهر

لەم ساڵەدا موهەلیب لەروباری بەڵخ تێپەڕی و لە کێش دابەزی. فەرماندەی پێشەنگەکانی ئەو (سێ هەزار پیاوی شەڕکەر) ئەبو الادهەمی زەمانی بو. ئەو خۆی فەرماندەی سوپاکە (پێنج هەزار پیاوی شەڕکەر) بو. ئەبو الادهەم لەروانگەی بەهێزی و بوێری و دورئەندێشی و چاکەخوازی بەرابەر بو لەگەڵ دوهەزار شەڕکەری بەئەزمون. کاتێك موهەلیب لەکەنارەکانی کێش بو، کوڕە مامی پاشای خوتەل هاتە لای و داوای لێکرد شەڕی خوتەل بکات. ناوی پاشا خوتەل (شبل) بو. یەزید دابەزی و کوڕە مامی پاشا لەشوێنێکیتر ئوردوی لێدا. شبل لەناکاو هێرشی کردەسەر و گەمارۆیدا و کوشتی. یەزید گەمارۆی خستە سەر قەڵاکەی شبل. خەڵکی ناو قەڵاکە لەسەر بنەمای دانی باج کەهەمان سات بۆ یەزیدیان رەوانە کرد، پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست. یەزید

لەشارەکەی ئەوان کشایەوە. موهەلیب کوڕەکەیتری لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بۆ شەڕی فەرمانڕەوای بوخارا ڕەوانە کرد. دەستەیەك لەدوژمنان لەگوندێك دابەزین. حەبیب لەگەڵ چوارهەزار شەڕکەر پێشرەوی کرد و ئەوانی کوشت و گوندەکەی سوتاند. لەوەدوا بەگوندە سوتاوەکە ناویان برد. حەبیب بۆ لای باوکی گەڕایەوە.

موهەلیب دو ساڵ لەکێش مایەوە. پێیان وت: باشترە ئەگەر بۆ شوێنێکی دورتر بەرێکەویت. وتی: خۆزگە تەنیا بەشی من لەم شەڕەدا، تەندروست مانەوەی ئەم سوپایە و گەڕانەوەی ئەوان بەسلامەتی بێت.

کاتێك موهەلیب لەکێش بو، دەستەیەك لەموزەریەکان هاتنە لای. ئەوانی گرت و زیندانی کردن. کاتێك گەڕایەوە، ئەوانی ئازاد کرد. حەجاج نامەی بۆ نوسی: ئەگەر لەگرتنی ئەوان کارێکی راستت ئەنجامدا، لەئازاد کردنیان کارێکی هەڵەت کرد و ئەگەر لەئازاد کردنیان کارێکی راستت ئەنجامدا، لەگرتنی ئەوان هەڵەت کرد. موهەلیب لەوەڵامدا بۆی نوسی: لێیان ترسام و ئەوانم زیندانی کرد و کاتێك ئاسودەبوم، ئازادم کردن. لەناو ئەو کەسانەی کەوتنە زیندان، یەکیان عەبدولەلیك کوڕی ئەبی شێخی قوشەیری بو.

موهەلیب لەسەر بنەمای بەهایەك کە بەردەوام لەخەڵکی کێشی وەربگرێت، لەگەڵ ئەوان پەیمانی ئاشتی مۆر کرد. نامەی کوڕی ئەشعەسی بۆ هات کەدەیوت: من حەجاجم لەسەر کار لابردوە، بۆ هاوکاریم ڕەوانە بە. ئەو نامەکەی بۆ حەجاج ڕەوانە کرد و خۆی لەکێش مایەوە.

# رەوانە کردنی سوپا بۆ شەڕی رۆتبیل

بە فەرماندەیی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس

ئێمە ئاماژەمان بە چۆنیەتی رۆژگاری موسوڵمانانندا کاتێك ئەبوبەکرە ئەوانی بۆ سەرزەمینی رۆتبیل کرد، کەچ بەلاَ و گرفتاریەکیان بەسەر هات. حەجاج داوای فەرمانی لە عەبدولمەلیك کرد تا جارێکیتر سوپایەك بۆ شەڕی رۆتبیل رەوانە بکات. عەبدولمەلیك فەرمانی پێدا. حەجاج دەستی بەئامادە کردنی سوپاکەی کرد. داوای لەخەڵکانی کوفە کرد بیست هەزار شەڕکەر رەوانە بکەن و داوای لەخەڵکانی بەسرە کرد بیست هەزار شەڕکەر بۆ شەڕ ئامادە بکەن. بۆ ئەم کارە زۆری هەوڵدا و هەمو بەخششەکانی خەڵکی لەپێشەوە پێ بەخشین و جیاواز لەوە دو هەزار هەزار (دو ملیۆن)درەمی بۆ ئەوان خەرج کرد و ئەسپی تیژپێ و کەرەستەی شەڕی فراوانی خستە بەردەستیان. هەر پیاوێك کەناوبانگی بوێری و ئازایەتی بو، بەخششەکەی زیاتر کرد. عوبەید کوڕی ئەبی مێحجەنی سەقەفی وکەسانیتر لەناو ئەم دەستەیەدا بون.

کاتێك لەئامادە کردنی دو سوپاکە تەواو بو، عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەسی کردە فەرماندەی ئەوان. ئەو عەبدولرەحمانی بەدوژمنی خۆی دەزانی و دەیوت: هەرجار کەدەمدی، مەبەستی کوشتنی ئەوم دەکرد. شەعبی ئەم قسەی لەحەجاج بیست و عەبدولرەحمانی لێ ئاگادار کردەوە. وتی: سوێند بەخوا هەوڵ دەدەم بۆ ئەوەی حەجاج لەپێگەکەی دوربخەمەوە. کاتێك حەجاج ویستی عەبدولرەحمان وەك فەرماندەی ئەو سوپایە رەوانە بکات، ئیسماعیل کوڕی ئەشعەس (مامی عەبدولرەحمان ) پێی وت: عەبدولرەحمان رەوانە مەکە، سوێند بەخوا هەرجار کە لەروباری فورات پەڕیەوە، زنجیری فەرمانبردنی هەر فەرمانداریێکی پچڕاند. من لەیاخی بونی ئەو دەترسم. حەجاج وتی: ئەو لەوە ترسەنۆکترە رێگەی ناسازگاری لەگەڵ من بگرێتەبەر. ئەو عەبدولرەحمانی وەك فەرماندەی ئەو سوپایە دەست نیشان کرد. عەبدولرەحمان لەگەڵ سوپاکە بەرێکەوت تا گەیشتە سیستان. خەڵکەکەی کۆکردەوە و قسەی بۆ کردن و وتی: حەجاج منی کردۆتە فەرمانداری سنور و سەرزەمینەکانی ئێوە و فەرمانی پێداوم شەڕ لەگەڵ دوژمنان بکەم. دوژمن دەست درێژیان کردۆتە سەر ماڵ و سامانی ئێوە، کەس خۆی نەدزێتەوە چونکە سزا دەدرێت.

ئەوان لەگەڵ خەڵك ئوردویان لێدا و سەرقاڵی ئامادە کردنی خۆیان بون. عەبدولرەحمان لەگەڵ هەمو خەڵکان بەرێکەوت. ئەم هەواڵە بەرۆتبیل گەیشت و پەیك و پەیامی رەوانە کرد و داوای بەخشینی کرد و سوێندی خوارد باج بدات. عەبدولرەحمان رازی نەبو و پێشڕەوی کرد و ڕۆشتە ناو سەرزەمینەکانی ئەو. رۆتبیل سەرزەمینەکان، گوندەکان و قەڵاکانی یەك یەك تەسلیمی ئەو کرد و پاشەکشێی دەکرد. عەبدولرەحمان دەستی بەسەر هەمو سەرزەمینەکاندا گرت. هەر سەرزەمینێك کەدەستی بەسەردا دەگرت، فەرمانداریێکی بۆ دەست نیشان دەکرد و سوپایەکی دەکردە هاورێی. لەسەر دۆڵ و رێگاکان پاسەوانی دەست نیشان دەکرد و بەم شێوەیە پارێزگاری لەشوێنە مەترسیدارەکان کرد. کاتێك سەرزەمینی فراوانی لەپانتایی فەرمانڕەوایی رۆتبیل گرت و خەڵك لەتالآنیەکان سودیان بەرکەوت، رێگەی ڕۆشتنە ناو قوڵایی سەرزەمینەکانی رۆتبیلی لێگرتن و وتی: ئەوەی ئەمساڵ لەسەرزەمینەکانی ئەوان تالآنمان کرد بەسە، تا باجیان لێومربگرین و بیانناسین و موسوڵمان شارەزایی چۆنیەتی کاروبارەکانیان ببن و بەخواستی خوا ساڵێکیتر دەگەرێینەوە و شەڕیان لەگەڵ دەکەین و ژن و سامان و مەڕوماڵآت و گەنجەکان لەقوڵایی سەرزەمینی ئەوان بەدەست دێنین و خوای گەورە ئەوان لەناو دەبات. دواتر نامەی بۆ حەجاج نوسی و ئاگاداری کردەوە کە دەستی بەسەر کام سەرزەمینانەدا گرتوە ومەبەستی چ کارێکی کردوە.

سەبارەت بەرەوانە کردنی عەبدولرەحمان ئامآژەیان بەگێرانەوەیەکی دیکە داوە، بەم شێوەیە: حەجاج، هێمیان کوڕی عەدی سەدوسی لەپادگانێك لەکرمان جێگیر کردبو تا ئەگەر فەرمانداری سیستان یا سند نیازیان بەهاوکاری ئەو بو، ئامادە بێت. هێمیان شۆڕشی کرد و حەجاج عەبدولرەحمان کوڕی محەممەدی بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد کە شەڕی لەگەڵ کرد و هێمیان شکستی خوارد و هەڵات و عەبدولرەحمان لەشوێنەکەی ئەو مایەوە. دواتر عوبەیدالله کوڕی ئەبی بەکرە (فەرمانداری سیستان) مرد و حەجاج فەرمانی فەرمانداری سیستانی بۆ عەبدولرەحمان نوسی و ئەم سوپا گەورەی بۆ هاوکاری ئەو رەوانە کرد کە لەبەر گەورەیی بە (سوپای تاووسان) ناویان برد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا ئەبان کوڕی عوسمان (فەرمانداری مەدینە) حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. فەرمانداری عێراق و رۆژهەڵات حەجاج و فەرمانڕەوای خوراسان موهەلیب بەنوێنەرایەتی حەجاج. دامەزراوەی دادی بەسرە لەژێر دەستی موسا کوڕی ئەنس و لەکوفە ئەبو بەردە.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: ئەسلەم، کۆیلەی عومەر کوڕی خەتاب، ئەبو ئیدریسی خەوەلانی، عەبدالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب( کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٠٣/٨٤ زایینی یا ٨٥/ ٧٠٤ زایینی یا ٨٦/ ٧٠٥ زایینی یا ٩٠/ ٧٠٩ زایینی مرد). مەعبەد کوڕی عەبدالله کوڕی عولەیمی جوهەنی کەحەدیسی (دباغ) دەگێڕێتەوە و یەکەم کەسە بە قەدەر (توانایی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆی، ئازاد بونی خەڵك) رازی بو و لەبەسرە جاری لێدا و حەجاج ئەوی کوشت و دەستەیەك دەڵێن: عەبدولەلیك کوڕی مەروان لەدیمەشق سەری بڕی. محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب (محەممەدی حەنیفە) جونادە کوڕی ئومەییە کەچاوی بەپێغەمبەر کەوتبو و لەسەراسەری رۆژگاری معاویە کاروباری شەڕی دەریایی لەئەستۆدابو، سایب کوڕی یەزید کوڕی خوشکی نەمر کەدەستەیەك دەڵێن: ساڵی ٧٠٥/٨٦ زایینی مرد ( و لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بو)، سوەید کوڕی غەفەلە، عەبدالله کوڕی ئەوفی( دوایین کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر کە لەکوفە مرد)، جوبەیر کوڕی نوفەیری حەزرەمی کە رۆژگاری جاهلی بینی بەڵام چاوی بە پێغەمبەر(د.خ) نەکەوت.

## روداوەكانی ساڵی هەشتا و یەكی كۆچی ( ٧٠٠ زایینی )

### لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك كوڕی مەروان كوڕەكەی عوبەیداللەی بۆ شەڕ ڕەوانە كرد و ئەو دەستی بەسەر كالیكلادا گرت.

كوژرانی بوحەیر كوڕی وەرقا ء

لەم ساڵەدا بوحەیر كوڕی وەرقا ئی سورەیمی كوژرا.

داستانی كوژرانەكەی بەم شێوە بو كە كاتێك بوكەیر كوڕی وەساج كوژرا (و ئەم دوانە هەردوكیان تەمیمی بون) و ئاماژەمان بەكوژرانی ئەودا، بەفەرمانی ئومەییە كوڕی عەبدالله و لەسەر دەستی بوحەیر و بەهاندانی ئەو بو، عوسمان كوڕی رەجا ءكوڕی جابر یەكێك لەپیاوانی عەوف كوڕی سەعد لە (كوڕەكان) ئەم هۆنراوەی خوارەوەی بۆ هاندانی دەستەیەك لە(كوڕان) لەبنەماڵەی بوكەیر هۆنیەوە و داوای لێكردن تۆڵەی بوكەیر بكەنەوە. (كوڕان) چەندین هۆز لەتەمیمن كە بەم ناوە بانگ دەكران. وتی:

| | |
|---|---|
| لعمری لقد اغضیت عینا القذی | و بت بطینا من رحیق مروق |
| و خلیت ثارا طل و اخترت نومة | و من یسرب الصهباو بالوتر یسبق |
| فلو كنت من عوف بن سعد ذوابة | تركت بحیرا فی دم مترقرق |
| فقل لبحیر نم و لا تخش ثائرا | ببكر فعوف اهل شاء حبلق |
| دع الضان یوما قد سبقتم | و صرتم حدیثا بین غرب و مشرق |
| و هبوا فلو امسی بكیر كعهده | لعاداهم زحفا بجاواء فیلق |

یانی: سوێند بەگیانی خۆم، خۆڵ و خاشاك لەچاوتا بو و چاوت لێكنا، شەرابێكت خواردەوە و سكت ئاوسا. خوێنێكی رژاوت پشت گوێ خست و خەوی خۆشت هەڵبژارد، هەركەس شەراب بەستەم بخوات، پێش دەكەوێت. ئەگەر لەناو عەوف كوڕی سەعد لەگەورەكان بویت، بوحەیری پیاوكوژت لەناو دەریایەك لەخوێندا دەخنكاند. لەمنەوە پەیامێك بەبوحەیر بگەیێنە وبڵێ: ئاسودە بخەوە و لەتۆڵەستێنەكان مەترسە چونكە خەڵكانی بەكر هێرش ناكەنە سەرتۆ و عەوف سەرقاڵی مەڕوماڵاتەكەی خۆیەتی.

شوانێك دیاری بکە لەو رۆژەی خوێنی ئێومیان پێشێل کرد و پێشتان کەوتن و بونە داستانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا. وشیار ببنەوە چونکە ئەگەر بوکەیر بگەرێتەوە بۆ رۆژگاری گەنجی و ژیان، بێ گومان بەسوپایەکی گەورە هێرش دەکاتە سەریان.

هەروەها وتی:

فلو کان بکر بارزا فی ادابه　　　و ذی العرش لم یقدم علیه بحیر

ففی الدهر ان ابقانی الدهر مطلب　　　و فی الله طلاب بذاك جدیر

یانی: ئەگەر بوکەیر هەمو کەرەستەکانی شەڕی خۆی پێدەبو، سوێند بەخوای تەخت و ئاسمان بوحەیر بوێری کوشتنی ئەوی نەدەبو. بەڵام رۆژگار، ئەگەر بەزیندو بمهێڵێتەوە، مەبەستەکەم دەخاتە بەردەستم و خواوەند، ئەگەر بخوازێت، بەباشی تۆڵە دەستێنێتەوە.

بوحەیریان ئاگادار کردەوە کەدەستەیەك لەخەڵکانی بوکەیر لە (کوڕان) هەڕەشەی کوشتنی لێدەکەن. وتی:

ثو عذنی الابناء جهلا کانما　　　یرون فنائی مقفرا من بنی کعب

رفعت له کفی بعضب مهند　　　حسام کلون الثلج ذی رونق عضب

یانی: (کوڕان) بەنەزانی هەڕەشەی کوشتن لەمن دەکەن، وەك بڵێی مەرگی من بەدۆزراوەیەك لەبەنی کەعب دەزانن. من بوم کە بەشمشێرێکی تیژ و بڕەر، تیغێکی جەرگ کونکەری هیندی، سپی لەرەنگی بەفر، درەوشاوە وەك ئاوێنە، هێرشم کردە سەر و کوشتم.

لەم کاتەدا حەفدە پیاو لەبەنی عەوف بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی بوکەیر پەیمانیان بەست. گەنجێك لەناو ئەوان بەناوی شەمردل لەبیابانەوە بەرەو خوراسان ملی رێگەی گرتەبەر و گەشتە ئەو ناوچەیە. بوحەیری بینی لەشوێنێك وەستاوە. رمێکی لێدا و ئەوی خستە سەرزەوی و گومانی کرد کە ئەوی کوشتوە. خەڵك وتیان: ئەم پیاوە لەخەواریجە. لەگەڵ خەڵکان شەڕی کرد و لەئەسپەکەی خۆی کەوتەخوار و گوژرا.

دواتر صەعصەعە کوڕی حەربی عەوفی مەڕوماڵاتەکەی خۆی فرۆشت و لەبیابانەوە بەرەو سیستان بەرێکەوت و بوبە دراوسێی یەکێك لەنزیکەکانی بوحەیر و خۆی بەکەسێك لەبەنی حەنیفە لەیەمامە ناساند و لەگەڵ ئەوان هاونشینی کرد تا تێکەڵاوی

بون. دواتر بەوانی وت: من سامانم لەخوراسان هەیە، نامەیەك بۆ بوحەیر بنوسن تا لەوەرگرتنەوەی سامانەکەم هاوکاریم بکات. نامەیان بۆنوسی و ئەو بەرێکەوت و ڕۆشتە لای بوحەیر کە لەو کاتەدا لای موهەلیب ژیانی بەسەر دەبرد و لەشەڕەکاندا هاوکاری دەکرد. دەستەیەك لەبەنی عەوف بینی و نهێنی خۆی لەگەڵدا باس کردن. چاوی بەبوحەیر کەوت و پێی وت کە یەکێك لەبەنی حەنیفە لەهاوەڵانی ئەبی بەکرمیە و سامانی لەسیستان و میراتی لەمەرو هەیە و هاتوە تا بیفرۆشێت و بۆ یەمامە بگەرێتەوە. بوحەیر پێشوازی لێکرد و فەرمانیدا برێك درەمی وەك خەرجی پێ بدەن. بەڵێنی هاوکاری کردنی پێدا. صەعصەعە وتی: لای تۆ دەمێنمەوە تا خەڵکان دەگەرێنەوە. مانگێك لای ئەو مایەوە و هاورێ لەگەڵ بوحەیر سەردانی موهەلیبی دەکرد. بوحەیر لەسەرەتاوە کەمێك ترسابو بەلآم کاتێك نامەی هاورێکانی نیشاندا، ئارام بویەوە و کاتێك وتی لەبەنی حەنیفەیە، بەتەواوی لێی دڵنیا بو.

صەعصەعە رۆژێك ڕۆشتە لای موهەلیب کە بوحەیری لای بو. ئەو کراسێك و رۆپۆشێکی لەبەر کرد. لەپشت سەری ئەو دانیشت و لێی نزیك کەوتەوە وەك ئەوەی بیەوێت قسەی لەگەڵدا بکات. خەنجەرێکی دەرکێشا و لەکەلەکەی چەقاند و هاواری کرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی بوکەیر دەکەن! ئەویان گرت وبردیانە لای موهەلیب. وتی: هاوار لەتۆ، خوێنی خۆتت نەویست و خۆت لەناو برد چونکە بوحەیر ترسی لەسەر نەماوە. صەعصەعە وتی: خەنجەرێکی ئەوتۆم لێدا ئەگەر بەسەر هەمو خەڵکاندا دابەش بکرێت، هەمویان دەمرن. من ئاوساوی سکیم لەسەر دەستی خۆم هەست پێکرد. موهلیب ئەوی خستە زیندان. دەستەیەك لە کوڕان هاتن و سەریان ماچ کرد. بوحەیر بەیانی ئەو رۆژە مرد. کاتێك بوحەیر مرد، صەعصەعە وتی: ئێستا هەرکارێك پێتان خۆشە بیکەن. مەگەر پەیمان و سوێندی کوڕانی عەوف نەهاتەدی و من تۆڵەی خۆم نەسەندەوە؟ سوێند بەخوا چەندین جار بەنهێنی دەمتوانی بیکوژم بەلآم نەمویست. موهەلیب وتی: پیاوێکم نەبینیوە بۆ مردن لەم پیاوە دەست و دڵ کراوەتر بێت. فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

دەستەیەك دەڵێن: موهەلیب پێش مردنی بوحەیر صەعصەعەی بۆ لای ئەو رەوانە کرد کەکوشتی و دواتر خۆی مرد.

مردنی ئەو بۆ موهەلیب دژوار بو و گوران و بەنی عەوف تورە بون و وتیان: بۆ هاورێکەی ئێمە کوژرا؟ مەگەر تۆڵەی خۆی نەسەندەوە؟ دەستەکان و هۆزەکانیتر لەبەنی تەمیم وەڵامیان دانەوە بەشێوەیەك خەڵك لەهەڵگیرسانی شەڕ دەترسان. پیرمەندان وتیان: بوحەیر لەبەرابەر بوکەیر و تاوانی خوێنی صەعصەعە بدەن. ئەوان خوێنبایی صەعصەعەیاندا. پیاوێك لەکورەکان بۆ وەسفی صەعصەعە وتی:

لله درفتى تجاوز همه          دون العراق مفاوزا و بحورا

ما زال يدئب نفسه و ركابة     حتى تناول فى الحروب بحيرا

یانی: خۆشەویستی خوا پێشکەش بەجوامێرێك بێت کە مەبەستی ئاسنینی ئەو سەرزەمینی عێراقی بڕی و بیابان و دەریاکانی لەپشت سەری خۆیەوە بەجێهێشت. بەردەوام خۆی و ئەسپەکەی خستە رەنجەوە تا لەو بگرە وبێنەدا دەستی بەبوحەیر گەیشت.

## هاتنی دەیلەمیەکان و بەسەرهاتی ئەوان

قەزوێن سنوری موسوڵمانان لەلای دەیلەم بو. سوپاییەکان شەو و رۆژ لەوێ پاسەوانیان دەدا. کاتێك ئەم ساڵە گەیشت، لەناو دەستەی پاسەوانەکانی ئەوێ محەممەد کوڕی ئەبی سەبرە دەرکەوت. ئەو سوارکارێکی بوێر و گەورە و بێزار نەبو لەشەڕەکانی خۆی بو. کاتێك گەیشتە قەزوێن، خەڵکانی بینی پاسەوانی دەدەن و شەوانە ناخەون. بەوانی وت: ناترسن شەوانە دوژمن هێرش بکاتە سەرتان و شارەکەتان بگرێت؟ وتی: بەڵێ دەترسین. وتی: ئەگەر ئەو کارە بکەن، دادپەروەریە. دەرگاکان بکەنەوە چونکە ترستان لەسەر نیە. دەرگاکانیان کردەوە.

هەواڵی ئەم کارە بەدەیلەمیەکان گەیشت. لەناکاو هێرشیان کردە سەریان و رژانە ناوشارەکە. خەڵك هاواریان کرد. محەممەد کوڕی ئەبی سەبرەی جوعفی وتی: دادپەروەریان کرد. دەرگاکانی شار لەسەر ئەوان وئێمە دابخەن و شەڕیان لەگەڵ بکەن. دەرگاکانیان بەست و شەڕیان دەست پێکرد. کوڕی ئەبی سەبرە پیاوانە شەڕی کرد و موسوڵمانان بەسەر ئەواندا زاڵبون و یەك کەسیان بەزیندویی رزگاری نەبو. ناو و ناوبانگی محەممەد بەم کارەی بەرز بویەوە و دوای ئەوە دەیلەمیەکان سنوری شارەکانی

خۆیان بەجێنەهێشت و محەممەد لەو خاڵە سنوریە ناوی کەوتە سەرزاران. ئەو شەرابی زۆری دەخوارد. تا رۆژگاری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بەو شێوە مایەوە. عومەر فەرمانیدا ئەویان بۆ زوراره رەوانە کرد کە بەماڵی خراپەکاران ناودەبرا. ئەویان بۆ ئەوێ رەوانە کرد. لەم کاتەدا دەیلەمیەکان هێرشیان کرد و زیانیان بەموسوڵمانەکان گەیاند. دوای ئەو پەرێشانی لەکارەکاندا دروست بو و لەبەر ئەمە خەڵك بۆ عەبدولحەمید کوڕی عەبدولرەحمان نامەیان نوسی و داوایان کرد کوڕی ئەبی سەبرە بگەڕێنێتەوە. ئەو نامەی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوسی و عومەر فەرمانی گەڕانەوەی ئەوی دەرکرد. گەڕایەوە و پارێزگاری لەو شارە کرد.

محەممەد برایەکی هەبو بەناوی خوسەیمە کوڕی عەبدولرەحمان. ئەو لەفەقیهەکان بو (زانا ئاینیەکان). عەبدولرەحمان ناوی ئەبی سەبرە بو.

# شۆڕشی عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس لەبەرابەر حەجاج

لەم ساڵەدا عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس و هاورێکانی لەسوپاکەی عێراق ڕێگەی ناسازگاریان لەگەڵ حەجاج گرتەبەر و بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. دەستەیەك دەڵێن: ئەمە لەساڵی ٧٠١/٨٢ زایینی رویدا. هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە حەجاج، عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەدی وەك فەرماندەی سوپایەك دەستنیشان کرد و بۆ سەرزەمینی رۆتبیلی نارد. ئەو ڕۆشتە ئەو سەرزەمینە و تاڵانی کۆکردەوە و دەستی بەسەر قەڵاکاندا گرت و نامەی بۆ حەجاج نوسی و لەکاروبارەکان و بارودۆخ ئاگاداری کردەوە و وتی بۆچونی من ئەوەیە ئەم ساڵ نەڕۆینە قوڵایی سەرزەمینەکانی رۆتبیل تا خەڵك شارەزای رێگاکان ببن و باج کۆبکەنەوە کە پێشتر ئاماژەمان بەم بابەتەدا.

کاتێك نامەکەی بەدەستی حەجاج گەیشت، لەوەڵامدا نوسی: نامەی تۆ نامەی پیاوێکە ئارەزومەندی ئاگربڕە و بۆ ئاشتی و ئارامی هەوڵ دەدات. لەگەڵ دوژمنێکی ریسوا و کەم بەنەرمی هەڵس و کەوت دەکات کە سوپایەکی لەموسوڵمانان لەناو بردوە، چونکە کاتێك تۆ سوپاکەی من و شمشێرەکەی من لەدوژمنان دوردەخەیتەوە، ئەو موسوڵمانانەی لەم رێگادا کوژراون، بەکەم هەژمار دەکەیت و چاوپۆشی لەخوێنی ئەوان دەکەیت. بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانم بەرێکەوە، قوڵایی سەرزەمینی ئەوان بگرە و قەڵاکانیان خاپورو پیاوە شەڕکەرەکانیان بکوژە و ژن و مناڵەکانیان ئەسیر بکە. دواتر نامەیەکی هاوشێوەی نامەی یەکەم نوسی کە دەیوت: دوای سڵاو، فەرمان بەموسوڵمانەکانی ئەو دیارە بدە تا کشتوکاڵ بکەن و لەوێ بمێننەوە چونکە سەرزەمینی ئەوانە تا خوا سەرزەمینەکانی تریان بۆ ئاوەڵا بکات. دواتر نامەی سێیەمی نوسی و وتی: ئەگەر ئەوەی فەرمانم پێداوە، ئەنجامی بدەیت، چ باشتر و گەرنە ئیسحاقی برات دەبێتە فەرماندەی خەڵکان.

عەبدولڕەحمان خەڵکی کۆکردەوە و بەوانی وت: ئەی خەڵکینە، من چاکەخوازی ئێوەم و حەز بەباش بونی ژیانی ئێوە دەکەم و ئەوەی سود بەئێوە بگەیێنێت، پارێزگاری

لێ دەکەم. بۆچونی من سەبارەت بەشەڕ لەگەڵ دوژمنان ئەوەبو کە بیرمەندان و خاوەن ئەزمونەکانی ئێوە پەسەندیان کرد. حەجاجم لەمە ئاگادار کردەوە و ئێستا نامەکەی هاتوە و من بەناتەوان و سست لەقەڵەم دەدات و فەرمانم پێدەدات بەخێرایی لەقولآیی سەرزەمینەکانی ئەوان پێشڕەوی بکەم. ئەمە ئەو سەرزەمینەیە دوێنێکە براکانتان لەوێ لەناوچون. من یەکێك لەئێوەم، ئەگەر بەرێکەون، بەرێدەکەوم و ئەگەر بمێننەوە، لەگەڵ ئێوە دەمێنمەوە.

خەڵك هەستان و وتیان: لەبەرابەر دوژمنی خوا خۆڕاگری دەکەین، ئەگوێ لەقسەکانی دەگرین و نە فەرمانەکانی ئەنجام دەدەین. یەکەم کەس کەقسەی کرد، ئەبو توفەیل عامر کوڕی واسلەی کەنانی بو. ئەو چاوی بە پێغەمبەر(د.خ) کەوتبو. دوای هێنانە سەرزمانی ناوی خواوەند و وەسفی کردنی، وتی: دوای سلآو، حەجاج دەیەوێت، ئەو کارە لەگەڵ ئێوە بکات کە بێژەی یەکەم هێنایەر سەرزمان: کۆیلەکەت سوار ئەسپەکە بکە، ئەگەر لەناوچو، لەناچوە و ئەگەر رزگاری بو، هی تۆیە. حەجاج ترسی نیە ئێوە بخاتە ناو زیان و فەرمانی پێشڕەوی لەسەرزەمینێکی پان و بەرینتان پێ بدات کەسەراسەری بەکێو و دۆڵەکان داپۆشراوە. ئەگەر سەرکەوتن و تالآنی بەدەست بێنن، ئەو شارەکان دەخوات و سامانەکانی بەدەست دێنێت و سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو فراوان دەبێت. و ئەگەر دوژمن بەسەر ئێوەدا سەرکەوێت، ئێوە دوژمنانێکی سەرکۆنەکراون کەرەنج رێز لەوان ناگرێت و کەس لەئێوە بەزیندویی ناهێڵنەوە. حەجاج لەسەر کار لابەن و بەیعەت لەگەڵ سەروەری خۆتان عەبدولرەحمان ببەستن. من شایەتی دەدەم ئێوە یەکەم کەسانن کە ئەو لەسەر کار لادەبەن. خەڵك هاواریان کرد: لەسەر کار لامانبرد، لەسەر کار لامانبرد. دوژمنی خوامان لەسەر کار لابرد.

عەبد مؤمن کوڕی شەبس کوڕی رێبعی هەستا و وتی: ئەی بەندەکانی خوا، ئەگەر فەرمانبەری لەحەجاج بکەن، بۆ هەمیشە ئەم سنورە دەخاتە ژێر دەستی ئێوە و وەك فیرعەون بەبێگاری و کار ناچارتان دەکات چونکە من دەزانم ئەو یەکەم کەسە سوپاکەی ناچار بەبێگاری کرد. هاورێکانتان نابیننەوە و زۆربەتان لەبرسانا دەمرن. لەگەڵ سەروەری خۆتان بەیعەت بکەن و هێرش بکەنە سەر حەجاج و لەشارەکەتان دەریپەڕێنن. خەڵکان لەدەوری عەبدولرەحمان کۆبونەوە و لەسەر بنەمای لەسەر کار

لابردنی حەجاج بەیعەتیان لەگەڵ بەست و پەیمانیاندا بۆ دەرکردنی حەجاج لەعێراق هاوکاری عەبدولرەحمان بکەن. ئاماژەیان بە عەبدولمەلیك نەدا.

عەبدولرەحمان ، عەییاز کوڕی هێمیانی شەیبانی وەك فەرمانداری بۆست و عەبداللە کوڕی عامری تەمیمی وەك فەرمانداری زرەنج دەست نیشان کرد. لەگەڵ رۆتبیل لەسەر ئەو بنەمایە پەیمانی ئاشتی مۆرکرد کەئەگەر کوڕی ئەشعەس سەرکەوێت، رۆتبیل تا ئەو کاتەی ئەم زیندوە، باج نەدات و ئەگەر شکستی خوارد و داوای پەنای کرد، رۆتبیل پەنای بدات. دواتر بەرەو عێراق گەڕایەوە. ئەعشی هەمەدانی لەپێش ئەو بەرێکەوت و بەردەوام دەیوت:

| | |
|---|---|
| شطت نوی من داره بالایوان | ایوان کسری ذی القری و الریحان |
| من عاشق امسی بزابلستان | ان ثقیفا منهم الکذابان |
| کذابها الماضی و کذاب ثان | امکن ربی من ثقیف همدان |
| یوما الی اللیل یسلی ما کان | انا سمونا للکفور الفتان |
| حین طغی فی الکفر بعد الایمان | بالسید الغطریف عدالرحمان |
| سار بجمع کالدبا من قحطان | و من معد قداتی ابن عدنان |
| بجحفل جم شدید الارکان | فقل لحجاج ولی الشیطان |
| یثبت بجمع مذحج و همدان | فانهم ساقوه کاس الذیفان |

و ملحقوه بقری ابن مروان

یانی: دوره مەبەستەکانی کەسێك کە ماڵەکەی لەئەیوانە، ئەیوانی خوسرەو کە کە لێوانلێوە لەگوڵ و گیا و روەك. لەو عاشقەی لەزابولستان ژیان بەسەر دەبات، هۆزی سەقیف دو درۆزنیان هەیە، درۆزنی یەکەم و درۆزنی دوەم (موختار و حەجاج) خوا ئێمە بەسەر سەقیفی هەمەدان سەرکەوتو بکات. رۆژێك تا شەو، هەموی ئەوەی بەفیرۆچوە، دەکرێت چاك بکرێتەوە. ئێمە بۆ سەرکوتی ناباوەڕی ئاژاوەچی شۆڕشمان کردوە، کاتێك دوای باوەڕهێنان، روی کردە ناباوەڕی. لای سەروەری بەخشندە عەبدولرەحمان جێگیرین، ئەو بەسوپایەك هاوشێوەی کولە و مێرو هێرشی کرد. کوڕی عەدنان لەمەعدەوە هاتوە، هاورێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە کەستونەکانی بەهێز و ئەستورە. بەحەجاج بڵێ کەهاورێی شەیتانە، بڵێ دەبێت لەبەرابەر سوپایەك لەمەزحەج

و هەمەدان خۆراگری بکات، ئەوان ژەهرێکی کوشەندەی دەرخوارد دەدەن و ئەو بۆ گوندەکانی کوڕی مەروان دوردەخەنەوە.

عەبدولرەحمان ، عەتییە کوڕی عەمرۆ عەنبەری کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی و حەرسیە کوڕی عەمرۆ تەمیمی وەك فەرمانداری کرمان دەست نیشان کرد. کاتێك گەیشتە پارس، خەڵك کۆبونەوە و وتیان: ئەگەر حەجاج، کارگوزاری عەبدولەلیکمان لەسەر کار لابردوە وەك ئەوە وایە کوڕی عەبدولەلیکمان لەسەر کار لابردبێت. لەبەر ئەمە لای عەبدولرەحمان کۆبونەوە. یەکەم کەس کوڕی عەبدولەلیکی لەسەر کار لابرد، تیجان کوڕی ئەبجەر لەتیم الله کوڕی سەعلەبە بو. هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، من ئەبو زەبانم داکەند بەهەمان شێوە کە ئەم کراسەم لە جەستەم داکەند. جگە لەدەستەیەکی کەم هەمو خەڵکان بە لەسەر کار لابردنی ئەو رازی بون. خەڵك لەگەڵ عەبدولرەحمان بەیعەتیان کرد. وتاری ئەوان لەکاتی بەیعەت بەمشێوە بو: لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند و شێوەی پێغەمبەر(د.خ) و شەڕ لەگەڵ گومڕاکان و لەسەر کار لابردنی ئەوان و شەڕ لەگەڵ پێشێل کەرانی ماڤ خەڵك بەیعەت دەکەین.

کاتێك حەجاج ئاگادار بویەوە کە خەڵك ئەویان لەسەر کار لابردوە، نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و لەکارەکانی عەبدولرەحمان ئاگاداری کردەوە و داوای لێکرد لەرەوانە کردنی سوپا بۆ هاوکاری ئەو پەلە بکات. حەجاج بەرێکەوت تا لەبەسرە دابەزی. کاتێك موهەلیب لەکارەکانی عەبدولرەحمان ئاگادار بویەوە، لەخوراسانەوە نامەی بۆ حەجاج نوسی: دوای سڵاو، عێراقیەکان پەنایان بردۆتە شەڕ لەگەڵ تۆ، ئەوان هاوشێوەی لافاون کە هیچ شتێك ناتوانێت ببێتە رێگریان تا لەشوێنی خۆیان ئارام دەگرنەوە. عێراقیەکان لەسەرەتای بزوتنەوەکەیان جموجۆڵێکیان هەیە و لەهەمان کات حەز و تامەزرۆیی بۆ گەیشتن بەماڵ و منداڵیان. رێگەیان لێمەگەرە تا لەکەسەکانی خۆیان نزیك ببنەوە و بۆنی مناڵەکانی خۆیان بکەن. دواتر لەهەمان شوێن شەڕ دەست پێبکە و هێرش بکەرە سەریان کەخوا سەرکەوتن بەتۆ دەبەخشێت. کاتێك حەجاج نامەکەی خوێندەوە، جوێنی پێدا و وتی: پارێزگاری لەمن ناکات بەڵکو لەکوڕە مامەکەی (عەبدولرەحمان) پارێزگاری دەکات.

کاتێك نامەی حەجاج بەعەبدولەلیك گەیشت، ترسا و خالید کوڕی یەزیدی بانگ

کرد و نامەکەی بۆ خوێندەوە. خالید وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر شۆڕش لەپانتاییەکانی سیستانەوە بێت، مەترسە. بەڵام ئەگەر لەخوراسانەوە بێت، منیش دەترسم. عەبدولمەلیك سوپای تەیارو بۆ حەجاجی ڕەوانە کرد. ئەوان لەدەستەی پەنجا یا سەد کەسی و یا کەمتر سوار ئەسپەکان دەبون و بۆ لای حەجاج بەرێدەکەوتن. نامەکانی حەجاج ڕۆژانە بە عەبدولمەلیك دەگەیشت و لەچۆنیەتی کاروبارەکان ئاگاداری دەکردەوە. حەجاج لەبەسرەوە بەرێکەوت تا ڕوبەڕوی عەبدولرەحمان ببێتەوە. ئەو لەشوشتەر دابەزی و پێشەنگەکانی خۆی بۆ دوجەیل ڕەوانە کرد. ئەوان ڕوبەڕوی سوارەکانی عەبدولرەحمان بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد و سەرئەنجام شکستیان خوارد. ئەمە لەڕۆژی جەژنی قوربانیساڵی هەشتا و یەك / ٢٥ ژانویەی ٧٠١ زایینی ڕویدا.

کاتێك هەواڵی تێکشکانی پێشەنگەکان بە حەجاج گەیشت، ڕوی کردە بەسرە. سوپاکەی عەبدولرەحمان شوێنیان کەوتن و کوشتاریان کردن و برێك لەکاڵاکانی ئەوانیان تاڵان کرد. حەجاج لەزاویە دابەزی و خۆراك و توێشوی بۆ خۆی کۆکردەوە و بەسرەی تەسلیمی عێراقیەکان کرد. کاتێك گەڕایەوە، جارێکیتر نامەکەی موهەلیبی خوێندەوە و وتی: خوا لێی خۆش بێت، شەرکەرێکی زانا و بەئەزمونە! ئەو سەد و پەنجا هەزار درەمی لەناو خەڵکدا دابەش کرد.

عەبدولرەحمان بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو بەسرە. هەمو خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ کرد تەنانەت قورئان خوێنەکان و بەتەمەنەکان، لەسەر بنەمای شەڕ لەگەڵ حەجاج و هاورێکانی لەخەڵکانی شام. هۆکاری پەلەکردنی ئەوان بۆ بەیعەت لەگەڵ عەبدولرەحمان ئەوە بو کە فەرماندارەکانی حەجاج بۆیان نوسی: باج کەمی کردوە وئەمان بەخشراوان باوەڕیان هێناوە و ڕویان کردۆتە شارەکان. ئەو بۆ فەرمانداری بەسرە و شوێنەکانی دیکەی نوسی: هەرکەسماڵی لەگوندەکان هەیە، دەبێت بۆ شوێنەکەی خۆی بگەڕێتەوە. ئەو خەڵکی دەرکرد تا باجیان لێوەربگرێت. خەڵك بەدەم گریانەوە شارەکانیان بەجێهێشت و بەردەوام هاواریان دەکرد: ئەی محەممەد، ئەی محەممەد! نەیاندەزانی ڕو لەکوێ بکەن. قورئان خوێنەکانی بەسرە بۆ بارودۆخی خەڵك دەگریان. کاتێك کوڕی ئەشعەس گەیشت، خەڵك لەسەر بنەمای شەڕ لەگەڵ حەجاج و لەسەر کار لابردنی

عەبدولمەلیك بەیعەتیان لەگەڵ كرد.

حەجاج لەدەوری خۆی سەنگەری هەڵكەند و عەبدولرەحمان لەدەوری بەسرە ئەو كارەی كرد. هاتنی عەبدولرەحمان بۆ ناو بەسرە لەكۆتایی زی حەججە/ ١٤ فەوریەی ٧٠١ زایینی بو.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا سلێمان كوڕی عەبدولمەلیك حەجی لەگەڵ خەڵك كرد. یەكێك لەحاجیەكان دایكی دەردا ی گەورە بو.

هەروەها لەم ساڵەدا كوڕی ئەبی زەنب لەدایك بو.

لەم ساڵەدا فەرمانداری مەدینە ئەبان كوڕی عوسمان بو، عێراق و سەراسەری رۆژهەڵات لەژێر فەرمانڕەوایەتی حەجاج، لەخوراسان موهەلیب، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی كوفە ئەبوبەردە و لەبەسرە عەبدولرەحمان كوڕی ئوزینە. سیستان و كرمان و بەسرە و پارس لەدەستی عەبدولرەحماندا بو.

## ڕوداوەکانی ساڵی هەشتا و دوی کۆچی ( ٧٠١ زایینی )

## شەڕ لەنێوان حەجاج و کوڕی ئەشعەس

دەڵێن: لەموحەڕەمی ئەم ساڵەدا/ فەوریەی ٧٠١ زایینی سوپاکەی حەجاج و عەبدولرەحمان بەسەختی شەڕی یەکیان کرد. لەموحەڕەمدا چەندین جار شەڕیان کرد. لەیەکێك لەڕۆژەکانی کۆتایی موحەڕەم شەڕەکەیان بەتەواوەتی دژوار و سوپاکەی حەجاج شکستیان خوارد و لەدەوری سەنگەرەکانی حەجاج شەڕیان دەکرد. ئەوان لەدوایین ڕۆژی موحەڕەم/ ١٦ مارسی ٧٠١ زایینی، پێشڕەویان بۆ لای یەك دەست پێکرد. هاوەڵانی حەجاج هێرشیان کرد بەڵام ڕیزەکانیان کەلێنی تێکەوت. حەجاج کەوتە سەر ئەژنۆ و وتی: دەسخۆش بۆ مەصعەب، چ گەورە پیاوێك بو کەئەو شەڕە مەترسیدارە ڕوی تێکرد و مەبەستی ئەوەی نەکرد پشت لەگۆڕەپانی شەڕ بکات.

سوفیان کوڕی ئەبرەدی کەلابی هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی سوپاکەی عەبدولرەحمان و شکستیدا. عێراقیەکان شکستیان خوارد و ڕویان لەکوفە کرد. عەبدولرەحمان لەگەڵ ئەوان بو. دەستەیەکی فراوان لەوان کوژران کە لەناویان عوقبە کوڕی عەبدئەلغافری ئەزدی و دەستەیەك لەقورئان خوێنەکان دەبینران.

کاتێك عەبدولرەحمان گەیشتە کوفە، بەهێزەکان و سوارەکانی بەسرە شوێنی کەوتن. ئەوانەی لەبەسرە مابونەوە، لەدەوری عەبدولرەحمان کوڕی عەباس کوڕی ڕەبیعە کوڕی جارس کوڕی عەبدولموتەلیب کۆبونەوە و لەماوەی پێنج ڕۆژ شەڕیان لەگەڵ حەجاج ئەزمون کرد و دواتر پەیوەستی کوڕی ئەشعەس بون. توفەیل کوڕی عامری واسلە کوژرا. باوکی کە لەهاوەڵانی پێغەمبەر بو، لەپرسەی ئەودا وتی:

خلى طفيل على الهم فانشعبا      و هد ذلك ركنى هدة عجبا

مهما نسيت فلا انساه اذ حدقت      به الا سنة مقتولا و منسلبا

و اخطاتنى المنايا لا تطالعنى      حتى كبرت و لم يتركن لى نشبا

و كنت بعد طفيل كالذى نضبت      عنه السيول و غاض الماء فانقبضا

یانی: توفەیل ڕۆشت و کۆمەڵێك خەمی بۆ من بەجێهێشت و ئەمە کارێك بو

بەتەواوی کۆڵەکەی ژیانی منی دارماند. هەر شتێك لەبیر بکەم، ئەو لەبیر ناکەم لەو کاتەی ڕمەکان دەوریان گرت و ئەو لەخاکدا کەوت و جل و بەرگەکانی فڕێنرا. مەرگ منی پشت گوێ خست و لەتەنیشتمەوە خزا و بەسەر من دانەباری تا ئەوەی گەورە و تەمەنم درێژ و سامان و مەبەستەکانم بۆ من نەمایەوە. دوای توفەیل هاوشێوەی کەسێکم کە کۆمەڵی لافاوەکان بڕژێنە سەر ئەو و ئەو بڕواتە ناو ئاو و لەناو بچێت.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی هەیە. ئەم شەڕەیان بە شەڕی زاویە ناوبرد.

حەجاج لەسەرەتای مانگی سەفەر/ ١٧ مارسی ٧٠١ زایینی کاروبارەکانی گرتەدەست و حەکەم کوڕی ئەیوبی سەقەفی کردە فەرمانداری ئەو شارە. عەبدولرەحمان بەرەو کوفە ڕۆشت. حەجاج لەکاتی هاتنەدەر لەکوفە، عەبدولرەحمان کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللە کوڕی عامری حەزرەمی هاوپەیمانی بەنی ئومەییەی وەك فەرمانداری ئەو شارە دەست نیشان کردبو. مەتەر کوڕی ناجیەی یەربوعی مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد و کوڕی حەزرەمی خۆی داشارد و لەکۆشکدا مایەوە. خەڵکانی کوفە هاورێ لەگەڵ مەتەر شۆڕشیان کرد و کوڕی حەزرەمی و خەڵکانی شامیان دەرکرد. ئەوان چوار هەزار کەس بون. مەتەر دەستی بەسەر کۆشکدا گرت و خەڵك لەدەوری ئەو کۆبونەوە و لەناو ئەواندا زێر و زیوی دابەش کرد و بەهەرکام دوسەد درەمی بەخشی.

کاتێك کوڕی ئەشعەس گەیشتە کوفە، مەتەر لەناو کۆشکەکەدابو. خەڵکانی کوفە بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشتن. ئەو ڕۆشتە ناو کوفە و خەڵکی هەمەدان لەدەوری کۆبونەوە. عەبدولرەحمان بەرەو کۆشك بەڕێکەوت بەڵام مەتەر کوڕی ناجیە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ڕێگەیان لێ بەست. عەبدولرەحمان پەیژەی بۆ دیوارەکانی کۆشك دانا و خەڵکی ناردە سەرەوە و دەستیان بەسەر کۆشکدا گرت. مەتەر کوڕی ناجیەیان بردە لای کە سەرەتا زیندانی کرد بەڵام دواتر ئازادی کرد و کردی بەیەکێك لەهاوەڵانی خۆی. کاتێك عەبدولرەحمان لەکوفە ئارامی گرت، خەڵکان لەدەوری ئەو کۆبونەوە و بەسرەییەکان مەبەستی ئەویان کرد کەیەکێك لەوان عەبدولرەحمان کوڕی عەباس کوڕی ڕەبیعەی هاشمی بو و ئەمە دوای شەڕی ئەو لەگەڵ حەجاج لەبەسرە رویدا.

حەجاج لەرۆژی شەڕی زاویە، دوای شکست یانزە هەزار کەسی کوشت. ئەوانی بەئەمان بەخشین فریودا. فەرمانی بەجارچیەکدا کەجارپیدا: فلان کوڕی فلان ئەمانی

نیە (ناوی کەسەکانی دەبرد). خەڵك گومانیان دەکرد هەموویان ئەمانیان پێ بەخشراوە. تەسلیم بون و حەجاج فەرمانیدا و هەموویان کوشتار کرد.

## شەڕی دەیروئەلجەماجیم

شەڕی دەیروئەلجەماجیم لەشەعبانی ئەم ساڵە/ سێپتامبەری ٧٠١ زایینی رویدا. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٨٣/ ٧٠٢ زایینی رویدا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بو کە حەجاج بۆ شەڕی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد لەبەسرەوە مەبەستی کوفەی کرد و لەدێری قوڕە دابەزی. عەبدولرەحمان لەکوفە هاتەدەر و لەئەلجەماجیم ئوردوی لێدا. حەجاج وتی: عەبدولرەحمان لەجەماجیم دابەزیوە و من لەدێری قوڕە. ئایا نابێت ئەمە بەخراپی لێکبدەینەوە؟ لای عەبدولرەحمان خەڵکانی کوفە و بەسرە و قورئان خوێنەکان و پاسەوانانی سنور و شەڕکەرانی ناو پادگانەکان کۆبونەوە و بۆ شەڕ لەگەڵ حەجاج یەکیان گرت چونکە زۆرینەی خەڵك لەو بێزار بون. ئەوان سەد هەزار شەرکەر بون لەوانەی بەخششیان وەردەگرت یا وەریاننەدەگرت. حەجاجیش پێش دابەزین لەدێری قوڕە هێزی پشتیوانی بۆ گەیشت. هەردولای شەڕکەر لەدەوری خۆیان سەنگەریان هەڵکەند. خەڵك رۆژانە شەڕیان لەگەڵ یەك دەکرد و سەنگەرەکانی خۆیان لەیەك نزیك دەکردەوە..

دواتر عەبدولمەلیك و خەڵکانی شام وتیان: ئەگەر عێراقیەکان بە لەسەر کار لابردنی حەجاج رازی دەبن، فەرمانداری لێ دەستێنینەوە چونکە ئەم کارە ئاسانترە لەشەڕ لەگەڵ ئەوان و بەم کارە خوێنەکان بەفیڕۆ نارژێن. عەبدولمەلیك کوڕەکەی خۆی عەبدالله و براکەی محەممەد (کە لەسەرزەمینی موسڵ بو) بەسوپایەکی گەورە بۆ لای حەجاج رەوانەی کردن و فەرمانی پێدان پێشنیاری لەسەر کار لابردنی حەجاج بەخەڵکانی عێراق بکەن و بەخششەکانیان بەوان ببەخشن بەهەمان شێوە کە بەخەڵکانی شام دەدرێت. عەبدولرەحمان بۆ هەر کام لەشارەکانی عێراق کە بیەوێت دەتوانێت بڕوات و تا زیندوە و عەبدولمەلیك خەلیفەیە، فەرمانداری ئەو شارە بێت. ئەگەر عێراقیەکان بەم پێشنیارە رازی بون، ئەو دوانە حەجاج لەسەر کار لابەرن و محەممەد کوڕی مەروان فەرمانڕەوای عێراق بێت و ئەگەر عێراقیەکان رازی نەبون، حەجاج فەرمانڕەوای خەڵك و فەرماندەی کاروباری تایبەت بەجەنگ بێت و محەممەد کوڕی مەروان و عەبدالله

کوڕی عەبدولمەلیك گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو بن.

هیچ کارێکی دژوارتر لەمە بۆ حەجاج روینەدابو. دەترسا عێراقیەکان بەپێشنیاری لەسەر کار لابرانی ئەو رازی ببن و عەبدولمەلیك ئەو لەسەر کار لاببات. نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی: سوێند بەخوا، ئەگەر لەگەڵ خەڵکانی عێراق رێگەی سازگاری بگریتەبەر و من لەکارەکەم دوربخەیتەوە، ئەوەندەی پێ ناچێت رێگەی ناسازگاری لەگەڵ تۆ دەگرنەبەر و شەڕی تۆ دەکەن و ئەم کارە تەنیا دەبێتە هۆی بوێری ئەم خەڵکانە. ئایا نەتبینیوە یا نەتبیستوە کە عێراقیەکان چۆن مالکی ئەشتەریان دژی عوسمان هەڵخراند و خوازیاری لەسەر کار لابرانی سەعید کوڕی عاص بون. کاتێك ئەویان لەسەر کار لابرد، یەك ساڵی نەخایاند هێرشیان کردە سەرعوسمان و خوێنیان ڕشت. ئاسن تەنیا بەئاسن دەتوانین بیکوتینەوە.

بەلأم عەبدولمەلیك بەمە رازی نەبو و دەیویست لەسەر کار لابردنی حەجاج بەعێراقیەکان پێشنیار بکات. کاتێك عەبداللە و محەممەد لەگەڵ حەجاج کۆبونەوە، عەبداللە کوڕی عەبدولمەلیك هاتەدەر و وتی: ئەی خەڵکانی عێراق، من کوڕی سەروەری باوەڕدارانم، ئەو ئەم پێشنیارانە بەئێوە دەکات. عێراقیەکان وتیان: ئەمشەو دەگەڕێینەوە بۆ شوێنەکانی خۆمان و لەم پێشنیارانە دەکۆڵینەوە. گەڕانەوە و عێراقیەکان راوێژیان کرد. کوڕی ئەشعەس وتی: پێشنیارێکی گرانبەهایان بەئێوە کردوە کەئەگەر پێی رازی بن دەرفەتێکی گونجاوە و دەبێت بیقۆزنەوە. ئەمڕۆ ئێوە لەگەڵ ئەوان بەرابەرن. ئەگەر لەشەڕی زاویە ستەمیان لەئێوە کرد، ئێوە ئەمڕۆ لەشەڕی شوشتەر بەسەر ئەواندا زاڵن. بەپێشنیارەکەیان رازی ببن چونکە ئێوە بەهێز و رێزدار لەبەرابەر خەڵکێکن کە لەئێوە دەترسن و ئێوە کەم و کوڕیەکانی ئەوان دەستنیشان دەکەن. بەردەوام کەسی بوێر لای ئەوان رێزی دەبێت و تا ئەو کاتەی زیندون (ئەگەر بەپێشنیارەکەیان رازی ببن) ئەوان قەرزاری ئێوە دەبن.

خەڵك لەهەمو لایەکەوە هاواریان کرد و وتیان: خواوەند ئەوانی لەناو بردوە و ئێستا لەناو بەدبەختی و کەم و کوڕی و لاوازیدا دەژین و ئێمە هێزێکی زۆر و بێ کۆتاییەمان لەبەردەستایە. نا سوێند بەخوا رازی نابین. دوبارە عەبدولمەلیکیان لەسەر کار لابرد.

یەکەم کەسان کەهەستان و قسەیان کرد، عەبداللە کوڕی زوابی سولەمی و عومەر کوڕی تیحان بون و ئەمە لەدێری جەماجیم رویدا. رێکەوتن و یەکیەتی ئەوان بۆ لەسەر کار لابردنی عەبدولەلیك لەدێری جەماجیم بەهێزتر لە رێکەوتنیان لەپارس بو.

لەم کاتەدا عەبداللە کوڕی عەبدولەلیك و محەممەد کوڕی مەروان بەحەجاجیان وت: ئەمە تۆ و سوپاکە و سوپاییەکان، درێژە بەکارەکانی خۆت بدە چونکە فەرمانیان بەئێمەداوە گوێرایەڵ و بیسەری فەرمانەکانی تۆبین. حەجاج وتی: وتم لەم کارانە مەبەستیان لەسەر کار لابردنی ئێومیە. ئەو دوانە وەك سەرومر سلاویان بۆ نارد و ئەویش بەهەمان شێوە وەك سەرومر سلاوی لەوان کرد. کاتێك عێراقیەکان لەجەماجیم لەسەر دورخستنەوەی عەبدولەلیك رێکەوتن، عەبدولرەحمان وتی: بەنی مەروان دایکم زەرقا عسەرکۆنە دەکەن. سوێند بەخوا هیچیان نەژادیان بەپاکی نەژادی من نیە، کوڕانی ئەبی عاص سەرفرازەکان لەپانتاییەکانی صەفوریەن. ئەگەر فەرمانڕەوایی تایبەت بێت بەقوڕەیشیەکان، چاوی ئەوان بەمن رۆن بۆتەوە، تۆوی ئەوان بوێرێکی وەك منی هێناوەتە دنیا و ئەگەر فەرمانڕەوایی تایبەت بەعەرەبەکان بێت، من کوڕی ئەشعەسم. ئەو دەنگی خۆی بەرز کردەوە تا خەڵك وتەکانی ببیستن. هەردولای شەڕکەر خۆیان ئامادە کرد.

حەجاج عەبدولرەحمان کوڕی سولەیمی کەلبی کردە فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی خۆی و عومارە کوڕی تەمیمی لەخمی کردە فەرماندەی باڵی چەپ. سوفیان کوڕی ئەبرەدی کردە فەرماندەی سوارەکان و عەبداللە کوڕی خوبەیبی حەکەمی کردە فەرماندەی پیادەکان. عەبدولرەحمان محەممەد باڵی راستی سوپاکەی بە حەجاج کوڕی حارسەی خەسعەمی و باڵی چەپی بە ئەبرەد کوڕی قورەی تەمیمی سپارد. عەبدولرەحمان کوڕی عەباس کوڕی ئەبی رەبیعەی هاشمی کردە فەرماندەی سوارەکان و فەرماندەیی پیادەکانی بەمحەممەد کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص سپارد. عەبداللە کوڕی رێزامی حارسی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی و قورئان خوێنەکانی لەژێر فەرماندەیی جەبەلە کوڕی زەحر کوڕی قەیسی جوعفی کۆکردەوە کە سەعید کوڕی جوبەیر و عامری شەعبی و ئەبو ئەلبەختەری تایی و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی لەیل لەناویاندا دەبینران.

هەردولا پێشڕەویان دەستپێکرد و ڕۆژان شەڕی یەکتریان دەکرد. نیازە پێویستیەکانی خەڵکانی عێراق ڕۆژانە لەسواد و کوفەوە دەهات و ئەوان بەئاسودەیی ژیانیان بەسەر دەبرد. خەڵکانی شام لەتەنگانەدابون، نرخەکان زیادی کردبو، گۆشت دەست نەدەکەوت وەك بڵێی لەهەر چوارلاوە گەمارۆیان خستبونە سەر. بەم پێیە، لەبەیانیەوە تا ئێوارێ شەڕیان دەکرد. سەرئەنجام ڕۆژێك گەیشت کە تیایدا جەبەلە کوڕی زەحر کوڕی قەیس کوژرا. دەستەکەی ئەویان بەدەستەی قورئان خوێنەکان ناودەبرد. دوژمنان هێرشیان دەکردە سەریان و ئەوان لەشوێنەکەی خۆیان نەدەجولاَن چونکە ئەو پیاوێکی بەهێز و خۆڕاگر بو. ڕۆژێك هاوشێوەی ڕۆژانی پێشو هاتنەدەر و حەجاج ریزەکانی خۆی تەیار کرد و عەبدولرەحمان سوپاکەی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. حەجاج بۆ شەڕ لەگەڵ دەستەی قورئان خوێنەکان سێ دەستەی شەڕکەری ئامادە کرد و جەراح کوڕی عەبداللەی حەکەمی کردە فەرماندەی ئەوان. ئەوان سێ جار هێرشیان کردە سەر قورئان خوێنەکان بەشێوەیەك کە هەردەستەیەك کە هێرشی دەبرد قورئان خوێنەکان لەشوێنی خۆیان نەدەجولاَن و خۆڕاگریان دەکرد.

## مردنی موغەیرە کوڕی موهەلیب

لەم ساڵەدا موغەیرە کوڕی موهەلیب لەخوراسان مرد. باوکی ئەوی کردبوە جێگری خۆی لەسنوری فەرمانڕەوایەتیەکەی. ئەو لەمانگی ڕەجەبی ساڵی ٨٢/ ئوتی ٧٠١ زایینی مرد. هەواڵی مەرگی ئەو بەیەزید کوڕی موهەلیب و سوپای شام گەیشت بەلاَم موهەلیبیان ئاگادار نەکردوە. یەزید فەرمانی بەژنەکاندا شین بگێرن. موهەلیب وتی: ئەمە چیە؟ وتیان: موغەیرە مرد. وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەرێینەوە (بقرە/ ٢/ ١٥٦) بێ ئۆقرەیی لەخۆی نیشاندا و پرسەی خۆی ئاشکرا کرد. دەستەیەك لەکەسانی نزیك ئەویان سەرکۆنە کرد. ئەو یەزیدی رەوانەی مەرو و پێشنیاری کارە پێویستەکانی پێکرد. فرمێسکی چاوەکانی ڕیشیان تەڕکرد.

پێش ئەمە موهەلیب لەکێش نیشتەجێ ببو و لەگەڵ خەڵکەکەی شەڕی دەکرد. یەزید هاوڕێ لەگەڵ شەست یا حەفتا سوار بەڕێکەوت. پێنسەد پیاوی شەڕکەر لەتورکەکان روبەرویان بونەوە. پرسیان: کێن؟ وتیان: بازرگان. وتیان: شتێکمان پێ بدەن. یەزید رازی نەبو بەلأم موجاعە کوڕی عەبدولرەحمان عەتکی جل و بەرگ و کەوانێکی بەوان بەخشی. ئەوان بەرێکەوتن بەلأم پەیمانەکەی خۆیان شکاند و گەڕانەوە و شەڕیان لەگەڵ کردن. پیاوێك لەخەواریج لای یەزید دەستبەسەر بوو. پیاوی خارجی وتی: بەزیندویی بمهێڵەوە. یەزید ئەوی ئازاد کرد و خارجی هێرشی کردە سەرئەوان و لەپشتەوە لەوانیدا و کەسێکی لەوان کوشت و جارێکیتر هێرشی بردە و کەسێکی دیکەی کوشت و بۆ لای یەزید گەڕایەوە. یەزید گەورەیەك لەگەورەکانی ئەوانی کوشت. لەم کاتەدا تیرێك بەرقاچی کەوت و ورەی ئەوان بەرز بویەوە. یەزید خۆڕاگری کرد تا جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد. وتیان: پەیمان شکێنیمان کرد و ئێستا ناگەرێینەوە تا بمرین یا بمرن یا شتێك بەئێمە بدەن. یەزید هیچی بەوان نەدا. موجاعە وتی: سوێندت دەدەم بەخوا، دەزانی کە موغەیرە مردوە، سوێندت دەدەم بەخوا کارێك مەکە تۆیش لەناو بچیت و داغی دڵی موهەلیب دو بەرابەر بێت. یەزید وتی: موغەیرە لەکۆتایی کارەکەی خۆی خۆش نەبو و منیش بەهەمان شێوە چاوپۆشی لەکۆتایی کارەکەی خۆم ناکەم. موجاعە دەستارێکی زەردی بۆ هاویشتن کە هەڵیانگرت و ڕۆشتن.

## ئاشتی موهەلیب لەگەڵ خەڵکانی کێش

لەم ساڵەدا موهەلیب لەگەڵ خەڵکانی کێش ئاشتی کرد.

پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بو کە گومانی لەدەستەیەك لەخەڵکانی موزەر کرد و ئەوانی خستە زیندان و دواتر ئاشتی کرد و گەڕایەوە و حورەیس کوڕی قوتبەی خوزاعی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و وتی: کاتێك بەهای ئازادی ئەوانت وەرگرت، بارمتەکانیان تەسلیم بکەرەوە.

موهەلیب بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە شاری بەلخ، نامەی بۆ حورەیس نوسی: من دڵنیام نیم لەوەی ئەگەر بارمتەکانیان بۆ بگێڕیتەوە، هێرش نەکەنە سەر تۆ. کاتێك بەهای ئازادی ئەوانت وەرگرت، بارمتەکان ئازاد مەکە تا دەگەیتە سەرزەمینی بەلخ. حورەیس بەپاشایی کێشی وت: موهەلیب ئەمە و ئەوەی بۆ نوسیوم. ئەگەر بەهای ئازادی

ئەوان بەمن بسپێریت، بارمتەکان ئازاد دەکەم و بەرێدەکەوم و ئاگاداری دەکەمەوە کە نامەی دوەمی تۆ کاتێك بەمن گەیشت کە بەهای ئازادی ئەوانم وەرگرت و بارمتەکانم تەسلیم کردەوە.

پاشای کێش بۆ دانی بەهای ئازادی و وەرگرتنەوەی بارمتەکان پەلەی کرد و حورەیس گەڕایەوە کە تورکەکان رێگەیان لێگرت و وتیان: بەهای ئازادی خۆت و هاورێکانت بدە چونکە ئێمە چاومان بەیەزید کوڕی موهەلیب کەوت و ئەو بەهای ئازادی خۆیدا. حورەیس وتی: ئەگەر ئەو کارە بکەم، دایکی یەزید کوڕی موهەلیب منی هێناوەتە دونیا. ئەو لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و کوشتاری کردن و چەند کەسێکی لەوان ئەسیر کرد کە بەهای ئازادی خۆیاندا و ئازادی کردن و دواتر پارەکەیشی بۆ گەڕاندنەوە.

وتارەکەی بەگوێی موهەلیب گەیشت و وتی: ئەم کۆیلە خۆی لەوە بەگەورەتر دەزانێت کەدایکی یەزید ئەوی هێنابێتە دنیا. موهەلیب تورە بو و کاتێك حورەیس لەبەلخ رۆشتە لای، وتی: بارمتەکان لەکوێن؟ وەڵامی دایەوە، پێش گەیشتنی نامەکەی تۆ ئازادم کردن و ئەوەی ببوە هۆکاری ترسانی تۆ، لەناوم برد. وتی: درۆت کرد، ویستت خۆت لەوان نزیك بکەیتەوە. فەرمانیدا و جلەکانیان لەبەر داکەند. ئەو لەبیستنی ئەم قسەیە بێ ئۆقرە بو بەشێوەیەك موهەلیب گومانی کرد ئەو نەخۆشیەکی تایبەتی هەیە. ئەوی روت کردەوە و سی قامچی لێدا. حورەیس وتی: حەزم دەکرد سێسەد قامچیم لێبدا بەڵام جلەکانی لەبەر دانەدەکەندم. سوێندی خوارد کەموهەلیب دەکوژێت. رۆژێك لەگەڵ موهەلیب سوار بو و فەرمانی بەدوکۆیلەکەی خۆیدا لەموهەلیب بدەن بەڵام ئەو کارەیان نەکرد و وتیان: دەترسین تۆ بکوژێت. حورەیس چیتر نەدەرۆشتە سەردانی موهەلیب. موهەلیب براکەی سابت کوڕی قوتبەی بەدوای ئەودا رەوانە کرد و پێی وت: تۆ وەك یەکێك لەکوڕەکانی خۆمیت کە هەندێکات ئەوانیش سزا دەدەم. سابت رۆشتە لای براکەی خۆی و داوای لێکرد سوار بێت و بڕواتە لای موهەلیب بەڵام حورەیس رازی نەبو و سوێندی خوارد کەدەیکوژێت. سابت وتی: ئەگەر ئەمە بۆچونی تۆیە با پێکەوە برۆینە لای موسا کوڕی عەبدالله کوڕی خازم. سابت لەوە دەترسا کە حورەیس موهەلیب بکوژێت و دواتر هەمویان کوشتار بکرێن. ئەو لەگەڵ دوسەد پیاو لەکەسە نزیکەکانی خۆی هاتەدەر و بۆ لای موسا کوڕی عەبدالله بەرێکەوتن.

## مردنی موهەلیب کوڕی ئەبی صوفرەو فەرمانداری کوڕەکەی یەزید

## لەخوراسان

کاتێك موهەلیب لەگەڵ خەڵکی کێش پەیمانی ئاشتی مۆر کرد، یەزید بۆ مەرو گەڕایەوە. کاتێك موهەلیب گەیشتە مەرورود، سورێژە یا کۆکە ڕەشەیی توش بو کە لەتاو ئازارەکەی گیانی سپارد. پێشنیاری بەحەبیبی کوڕی کرد نوێژی لەسەر بخوێنێت. پێی وتن: یەزیدم کردە جێگری خۆم، ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەو مەگرنەبەر. کوڕەکەی موفەزەڵ پێی وت: ئەگەر تۆیش ئەوت پێش نەدەخست، ئێمە ئەو کارەمان دەکرد.

منداڵەکانی بانگ کرد و پێشنیاری پێکردن لەناو یەك تەبا و کۆك بن. چەند تیرێکی دارینی داوا کرد و ئەوانی بەیەکەوە بەست و وتی: ئایا ئێستا کە پێکەوە بەستراون، دەتوانن بیشکێنن؟ وتیان: نە. وتی: ئەگەر بلاو ببنەوە، دەتوانن یەك یەك بیانشکێنن؟ وتیان: بەڵێ. وتی: یەکیەتی و پێکەوە بونی ئێوەیش هاوشێوەی ئەمەیە. وتی: پێشنیاری خواپەرستی و خۆپارێزیتان پێ دەکەم چونکە مردن دوا دەخات و سامانەکان فراوان و ژمارەکان زیاد دەکات. لەبڕین و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ئاگادارتان دەکەمەوە چونکە ئەم کارە ئاگری بەدواوەدێت و ریسوایی و لاوازی دەردەخات. ئەرکی سەرشانی ئێوە بێت گوێڕایەڵ و ملکەچ بن. دەبێت کردارتان لەوتارتان باشتر بێت. لەوەڵام و هەڵەی زمان بترسن چونکە هەندێ کات پێی پیاو دەخزێت بەلام زیندو دەمێنێتەوە بەلام ئەگەر زمان هەڵە بکات، لەهەڵەکەی لەناودەچن. ئەو کەسانەی بۆ لای ئێوە هاتوچۆ دەکەن رێزیان لێبگرن چونکە هەرئەوەندە پیاوێك ئێوارێ یا بەیانی بگاتە لای ئێوە، بۆ بیرهێنانەوەی ئێوە بەسەندە دەکات. بەخشش پێش دەست قونجاوی بخەن، جوامێری زیندو بکەنەوە، چاکەکاری بکەنە پیشە، چونکە ئەگەری هەیە پیاوێك لەعەرەب، زیانی هەژاری پێ ببڕێت و لەناچاریدا بمرێت و ئەوسا نەزانن چۆن روبەروی ئەم پێشهاتە ببنەوە. ئاگاداربن لەشەڕ بەچاوەڕوان بون و فریو دەست پێبکەن چونکە ئەم کارە لەبوێری باشترە. کاتێك شەڕ دەست پێبکات و کوشتار دروست ببێت، چارەنوس دەگات و لەم کاتەدا ئەگەر پیاو دورئەندێش بێت و سەرکەوتن بەدەست بێنێت، وەسفی دەکەن و ئەگەر شکست بخوات، دەڵێن: نەکەمتەرخەمی کرد، نەکەسێکی نەزان بو، بەڵکو چارەنوس بەسەریدا زاڵبو. ئەرکی سەرشانی ئێوەیە قورئان بخوێنن و حەدیسەکان فێر ببن و بەکولتوری فرەزانان خۆتان تەیار و لەزۆربڵەیی لەکۆڕەکاندا خۆتان بەدور بگرن.

دواتر مرد، خوا لێی خۆش بێت. ئەهار کوڕی تەوسعەی تەمیمی لەپرسەی ئەودا وتی:

| | |
|---|---|
| الا ذهب المعروف و العز و الغنى | و مات الندى و الجنود بعد المهلب |
| اقام بمرو الورد رهن ضريحه | و قد غاب عنه كل شرق و مغرب |
| اذا قيل اى الناس اولى بنعمة | على الناس قلنا هو و لم نتهيب |

یانی: بزانن کەچاکەکاری و ڕێزداری و بەتوانایی لەناوچو و بەخشش و دەستبلاوی لەدوای موهەلیب مرد. لەمەرورود بوبە بارمتەی ئارامگاکەی خۆی و سەراسەری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لەو چۆڵ بو. کاتێك بلێن: لە ناو خەلکان چ کەسێك بۆ بەخشین شیاوترە؟ ناترسین و دەلێین: ئەوە (موهەلیبە).

کاتێك مرد، کوڕەکەی یەزید نامەی بۆ حەجاج نوسی و ئەوی لەمەرگی موهەلیب ئاگادار کردەوە. ئەو فەرمانڕەوایی یەزیدی پشت ڕاست کردەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم سالەدا لە جەمادی الثانی / ژوئیەی ٧٠١ زایینی عەبدولەلیك ، ئەبان کوڕی عوسمانی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و هشام کوڕی ئیسماعیلی مەخزومی لەجێگەی ئەودانا. هشام، ئەوفل کوڕی موساحقی لەسەرپەرستی دامەزراوەی دادی مەدینە لابرد و عەمرۆ کوڕی خالیدی زەرقی لەشوێنەکەی ئەودانا.

هەروەها لەم سالەدا محەممەد کوڕی مەوران بۆ شەڕی خەلکی ئەرمەنستان بەرێکەوت و ئەوانی شکستدا. دواتر خوازیاری ئاشتی بون کە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان مۆر کرد و ئەبو شێخ کوڕی عەبداللەی کردە فەرمانداری ئەوان. خەلکی ئەرمەنستان پەیمانیان شکاند و ئەبو شێخیان کوشت. دەستەیەك دەلێن: ئەویان لەسالی ٨٣/ ٧٠٢ زایینی کوشت.

هەروەها لەم سالەدا ئەم کەسانە مردن: عەبداللە کوڕی شەداد کوڕی هادی لەیسی کە لەدوجەیل کوژرا، ئەبوجەوزا ءئەوس کوڕی عەبداللە رێبعی، عەتا کوڕی عەبداللە سەلیمی پارسا، زادان، ئەبو وایل، عومەر کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەعمەری تیمی لەتەمەنی شەست سالی و ئەبو ئومامە باهلی کەدەستەیەك دەلێن: لەسالی ٩١/ ٧١٠ زایینی مرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی هەشتا و سێی کۆچی و ( ٧٠٢ زایینی )

## درێژەی شەڕی دێرنەلجەماجیم

کاتێك سێ دەستە شەڕکەرەکەی حەجاج هێرشیان کردە سەر قورئان خوێنەکان لەسوپاکەی عەبدولرەحمان (بەفەرماندەیی جەبەلە کوڕی زەحر)، جەبەلە هاواری کرد: ئەی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی لەیلی، ئەی دەستەی قورئان خوێنەکان، ئەمڕۆ هەڵاتن لەهیچ کەسێك بەئەندازەی هەڵاتنی ئێوە قێزەون و ناشیرین نیە، من لەعەلی کوڕی ئەبی تالیبم بیست، کاتێك ڕوبەڕوی خەڵکانی شام دەبوینەوە، دەیوت: ئەی خواپەرستەکان، هەر کەس ستەمێکی بینی کە بەڕەوا دەزانرێت و کارێکی قێزەونی بینی کە بانگەشەی بۆ دەکرێت و لەدڵی خۆیدا سەرکۆنەی کرد، ڕزگاری بوە، هەرکەس بەزمانی خۆی سەرکۆنەی بکات، پاداشتی چاکەی پێدەبرێت و لەو هاوڕێیەی باشترە و هەرکەس بەشمشێر سەرکۆنەی کرد تا وتاری خوا سەرکەوێت و وتاری ستەمکاران ڕیسوا ببێت، کەسێکە ڕێگەی ڕاستی بەتەواوی ناسیوە و دڵی لەگومان خاڵیە. شەڕ بکەن لەگەڵ ئەم خەڵکە خراپەکارە کە مافەکانیان پێشێل کرد، کارە قێزەونەکانیان بڕەو پێدا و ڕاستی و دروستیان لەبەرچاو نەگرت و ستەمیان بەڕەوا زانی.

ئەبونەلبەختەری وتی: ئەی خەڵکینە، بۆ دین و دنیاتان شەڕ بکەن. شەعبی وتی: ئەی خەڵکینە، شەڕیان لەگەڵ بکەن و لێیان مەترسن چونکە سوێند بەخوا گومان ناکەم لەم جیهانە کەس لەوان ستەمکارتر و خراپەکارتر بێت. سەعید کوڕی جوبەیریش ئەم قسەی هێنایە سەرزمان. جەبەلە وتی: بەدڵ وبەگیان هێرش بکەنە سەر ئەوان و پشتیان تێمەکەن تا ڕێزەکانی ئەوان لەناو ببەن.

ئەوان پیاوانە هێرشیان کرد و دەستە شەڕکەرەکانیان لەشوێنی خۆیان هەڵکەند و بڵاوەیان پێکردن و پێشڕەویان کرد تا ڕیزەکانی ئەوانیان لەناو برد و ئەوانیان کوشتار کرد و گەڕانەوە و بینیان جەبەلە کوڕی زەحر کوژراوە وکەس نازانێت ئەو چۆن کوژراوە.

هۆکاری کوژرانەکەی ئەوەبو کاتێك هاوڕێکانی هێرشیان کردە سەر خەڵکانی شام و بڵاوەیان بەوان کرد، ئەو لەشوێنەکەی خۆی مایەوە تا هاوڕێکانی بگەڕێنەوە. دەستەیەك

لەخەڵکانی شام جیابونەوە و لەشوێنێکدا وەستان. کاتێك بینیان هاورێکانی جەبەلە پێشرەویان کرد، بەیەکیان وت: ئەوە جەبەلەیە، تا کاتێك هاورێکانی سەرقاڵی شەڕکردنن، هێرشی بکەنەسەر و خوێنی برێژن. ئەوان هێرشیان کرد و جەبەلە پشتی تێنەکردن بەڵکو هێرشی کردە سەرئەوان تا ئەوەی کوشتیان. ئەو کەسەی جەبەلەی کوشت، وەلید کوڕی نەحیتی کەلبی بو. سەری ئەویان بردە لای حەجاج و ئەو مژدەی بەهاوەڵانیدا. کاتێك هاورێیانی جەبەلە گەڕانەوە و ئەویان بەکوژراو بینی، پەرێشان بون و یەکتریان لەمەرگی ئەو ئاگادار کردەوە. ئەبولبەختەری بەوانی وت: ئاگاداربن کوژرانی ئەو بەسەر دڵ وبۆچونی ئێوەدا زاڵ نەبێت، ئەو هاوشێوەی پیاوێك بو لەئێوە کەکاتی مەرگی گەیشت و نەیتوانی پێش یا دوای بخات. بەڵام لاوازی لەناو قورئان خوێنەکان دەرکەوت و خەڵکانی شام هاواریان کرد: ئەی دوژمنانی خوا، لەناوچون چونکە فەرماندەکەی ئێوە کوژرا.

لەم کاتەدا بێستام کوڕی مەصقەلە کوڕی هوبەیرەی شەیبانی ڕۆشتە لای ئەوان. ئەوان لەهاتنی ئەو شادمان بون و وتیان: پیاوێکی شیاو هات تا جێگەی جەبەلە بگرێتەوە. ئەو لەشاری ڕەی هەوە هات. کاتێك گەیشتە لای عەبدولرەحمان ئەوی کردە فەرماندەی خەڵکانی رەبیعە چونکە پیاوێکی زۆر بوێر بو. ڕۆژێك شەڕی کرد و ڕۆشتە ناو لەشکرەکەی حەجاج و سی ژنی بەئەسیری گرت و دواتر ئەوانی ئازاد کرد. حەجاج وتی: بەم کارە (ئازاد کردنی ژنانی ئێمە) ژنانی خۆیان پاراست چونکە ئەگەر ئەوانیان ئازاد نەدەکرد ئەو کاتەی بەسەر ئەواندا سەردەکەوتم، ژنەکانیانم ئەسیر دەکرد.

ڕۆژێك ئەبو حومەید عەبدولرەحمان کوڕی عەوف رواسی هاتەدەر و داوای شەڕکەری کرد. پیاوێك لەخەڵکانی شام روبەروی بویەوە و ئەم دوانە شەڕیانە کرد و هەرکام بەویتری وت: من جوامێری کەلابیم. لەیەکیان پرسی: تۆ کێیت؟ زانیان کە کوڕی مامی یەکن. لەیەك جیابونەوە. عەبدالله کوڕی رەزامی حارسی هاتەدەر و داوای شەڕکەری کرد. پیاوێك لەسوپاکەی شام روبەروی بویەوە و لەسەر دەستی ئەو کوژرا و ئەم کارە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بو.

بۆ ڕۆژی چوارەم، دوبارە هاتەدەر. خەڵکانی شام وتیان: ئەوا هات خوا بیکوژێت. ئەو داوای شەڕکەری کرد و حەجاج بەجەراحی وت: روبەروی ببەرەوە. جەراح روبەروی

بویەوە و عەبدالله پێی وت (لەبەر ئەوەی هاورێی بو)، ئەی جەراح، هاوار لەتۆ، بۆ هاتیت؟ وتی: گرفتاری تۆ بوم. وتی: ئایا دەتەوێت کارێکی باشتر بکەیت؟ وتی: چ کارێك؟ عەبدالله وتی: من رادەکەم و تۆ بۆ لای حەجاج دەگەرێیتەوە تا کارێکی چاکمت بۆ ئەنجام دابێت و ئەو دەسخۆشیت لێ دەکات. بەڵام من لەبەر تەندروست مانەوەی تۆ بەرگەی گرفتاری خەڵکەکەم دەگرم چونکە حەز ناکەم پیاوێکی وەك تۆم لەخەڵکەکەم کوشتبێت. وتی: ئەو کارە بکە. جەراح هێرشی کردە سەر عەبدالله و عەبدالله وەڵامی دایەوە. جەراح بەتوندی پەلاماریدا و مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد. کۆیلەی عەبدالله لەسوچێکدا وەستابو و ئاوی دەخواردەوە، هاواری کرد: سەروەرم ئەم پیاوە دەیەوێت تۆ بکوژێت! عەبدالله بۆ لای جەراح گەرایەوە و گورزێکی لەسەریدا و ئەوی خستە سەرزەوی و وتی: ئەی جەراح، پاداشتێکی خراپی منت دایەوە. من خوازیاری رزگاری تۆبوم و تۆ خوازیاری مەرگی من. برۆ تۆم بەخزمایەت و خەڵکەکەی خۆم بەخشی.

دوای مەرگی جەبەلە کوڕی سەعد، سەعید کوڕی جوبەیر و ئەبولبەختەری تایی هێرشیان دەکردە سەر خەڵکانی شام و بەئەندازەیەك پێشرەویان کرد کەلەگەڵ ئەوان تێکەڵاو بون. شەڕ بۆ ماوەی سەد و سێ رۆژ بەردەوام بو چونکە دابەزینی ئەوان لەجەماجیم رۆژی سێیەمی رەبیعە الاوەل/ ٦ ئاوریلی ٧٠٢ زایینی و شکستی ئەوان لە ١٤ جەمادی الثانی / ١٥ ژانویە بو.

کاتێك رۆژی شکان گەیشت، زیاتر لەرۆژانی پێشو شەڕیان کرد. هاوەڵانی عەبدولرەحمان بەسەر سوپاکەی حەجاجدا سەرکەوتن و بەسەر ئەواندا زاڵبون و دڵنیا بون کەشکستیان دەدەن. لەم کاتەدا سوفیان کوڕی ئەبرەد فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی حەجاج هێرشی کردە سەر ئەبرەد کوڕی قورە تەمیمی فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی عەبدولرەحمان. ئەبرەد کوڕی قورە بێ ئەوەی شەرێکی ئەوتۆ بکات پاشەکشێی کرد بەشێوەیەك خەڵك گومانیان کرد ئەو بەنهێنی بۆ شکست خواردن پەیمانی بەستوە. کاتێك پاشەکشێی کرد، ریزەکان لەیەك هەڵوەشان و خەڵك بەکۆڵی یەکدا هەڵدەگەران و عەبدولرەحمان رۆشتە سەر تەختی وتاردان و هاواری لەخەڵك کرد: ئەی بەندەکانی خوا، لای من کۆببنەوە. دەستەیەك لەدەوری کۆبونەوە. ئەو خۆراگری کرد تا خەڵکانی شام لێی نزیککەوتنەوە و هاوەڵانی ئەو پیاوانە شەڕیان کرد و خەڵکانی شام گەشتنە ناو

سوپاکەی ئەو. عەبداللە کوڕی یەزید کوڕی مەفزەلی ئەزدی هاتە لای و وتی: دابەزە چونکە دەترسم ئەسیر بکرێیت، ئەگەری هەیە ئەگەر بگەڕێیتەوە، سوپایەکی دیکە بۆ شەڕی ئەوان ئامادە بکەیت تا خوا ئەوان لەسەر دەستی تۆ لەناو ببات. عەبدولرەحمان لەگەڵ هاوەڵانی خۆی هەڵات بەشێوەیەك تەنانەت ئاوڕیان نەدایەوە. دواتر حەجاج ڕۆشتە ناو کوفە، محەممەد کوڕی مەروان بۆ موسڵ و عەبداللە کوڕی عەبدولمەلیك گەڕایەوە بۆ شام. حەجاج بەیعەتی لەخەڵك وەرگرت، هیچ کەسی نەدەگرت مەگەر ئەوەی پێی دەوت: شایەتی بدە کە لەدین هەڵگەڕاویتەوە. ئەگەر دەیوت: بەڵێ، بەیعەتی لەگەڵ دەکرد وەگەرنە سەری دەبڕی. پیاوێك لەخەسعەمیان بردە لای ئەو کە لەهەمو خەڵکان دوری کردبو و بەویان ڕاگەیاند کە ئەو لەگەڵ خەڵکان نەبوە. حەجاج پێی وت: تۆ چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی شەڕ بویت (تا هەرکەس سەرکەوێت، پەیوەستی ئەو بیت) ئایا شایەتی دەدەیت کە ناباوەڕیت؟ وتی: پیاوێکی خراپ بم! من بۆ ماوەی هەشتا ساڵ خواپەرەستیم کردوە، دواتر شایەتی درۆ بۆ خۆم بدەم. وتی: دەتکوژم. وتی: ئەگەر بیشمکوژیت. حەجاج ئەوی سەربڕی و کەس لەخەڵکانی شام و عێراق نەمایەوە مەگەر ئەوەی سڵاوی بۆ نارد.

دواتر کومەیل کوڕی زیادی بانگ کرد وپێی وت. تۆ بویت کە ڕەخنەت لەسەروەری باوەڕداران گرت و سەرکۆنەت کرد؟ ئارەزوم دەکرد بەشێوەیەك بکەویتە بەردەستم. کومەیل وتی: لەکام یەکی ئێمە زیاتر توڕەیت؟ بۆ ئەو کە کینەی خەڵکانی لەدڵ گرت یا من کەلێی خۆش بوم؟ دواتر وتی: ئەی پیاوی سەقەفی، دیانەکانت نیشان من مەدە و هاوشێوەی گورگ مەمترسێنە چونکە سوێند بەخوا لەژیانی من زیاتر لەماوەی دو جار ئاو خواردنەوەی کەر نەماوەتەوە (کەر زۆر خێرا خێرا ئاو دەخواتەوە) هەر کارێك پێت خۆشە بیکە چونکە شوێنی بەیەك گەشتنەوەی ئێمە لای خوایە. حەجاج وتی: بەڵگەکان دژی تۆن. کومەیل وتی: بەو مەرجەی تۆ داوەر بیت. فەرمانیدا و سەریان بڕی. ئەو لەکەسە تایبەت و نزیکەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالب بو. یەکێتریان دوای ئەو هێنا. حەجاج وتی: پیاوێك دەبینم کە گومان ناکەم شایەتی بۆ ناباوەڕی خۆی بدات. پیاو وتی: فریوم دەدەیت؟ من ناباوەڕترین پیاوی سەر ڕوی زەویم، لەفیرعەون ناباوەڕترم. حەجاج پێکەنی و ئازادی کرد.

حەجاج بۆ ماوەی یەکی مانگ لەکوفە مایەوە و خەڵکانی شامی لەناو خەڵکانی کوفە جێ کردوە. ئەو یەکەم کەس بو جێگەی سوپاکەی لەناو ماڵی کەسانێتر ئامادە دەکرد. ئەم شێوازە تا ئێستا لەناو وڵاتەکانی عەجەم فەرمانڕەوایە. بناغەی هەر شێوەیەکی سەرکۆنە کراوی کەدانا، گوناحەکەی و گوناحی بکەرەکانی تا ڕۆژی هەستانەوە، لەئەستۆی ئەودایە.

## شەڕ لەمەسکەن

کاتێك عەبدولرەحمان شکستی خوارد، گەڕایەوە بۆ بەسرە و دەستەیەکی زۆر لەتێکشکاوەکان لەدەوری کۆبونەوە. لەناو ئەوان عوبەیداللە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەمورە کوڕی حەبیب کوڕی عەبدشەمسی قورەشی بو. فەرمانداری مەداین محەممەد کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص بو. حەجاج سوپایەکی کردەسەر و محەمەد پەیوەستی عەبدولرەحمان بو. عەبدولرەحمان لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر روبەروی حەجاج بویەوە کە بێستام کوڕی مەسقەلە کوڕی هوبەیرەی شەیبانی لەناویاندا بو. دەستەیەکی فراوان بۆ مەرگ بەیعەتیان لەگەڵ کرد. هەمویان لەمەسکەن کۆبونەوە. عەبدولرەحمان بەدەوری خۆی سەنگەری هەڵکەند بۆ ئەوەی تەنیا لەیەك قۆڵەوە شەڕ بکات.

خالید کوڕی جەریر کوڕی عەبداللە هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك بەنوێنەرایەتی خەڵکانی کوفە گەیشتنە لای. ئەوان بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەشەعبان/ سێپتامبەر ٧٠٢ زایینی شەڕیان کرد. زیاد کوڕی غەیسەمی قینی فەرماندەی پادگانەکانی حەجاج کوژرا و مەرگی ئەو حەجاج و سوپاکەی راچڵەکاند. حەجاج شەوی کردە ڕۆژ و سوپاکەی خۆی بۆ شەڕ هاندا. کاتێك بەرەبەیانی بەیانی بویەوە، تاریك و رون شەڕیان دەست پێکرد و قورسترین شەڕەکانیان لەگەڵ یەك ئەزمون کرد. سوارەکانی سوفیان کوڕی ئەبرەد بڵاوەیان پێکرا و حەجاج فەرمانیدا بە عەبدولەلیك کوڕی موهەلیب هێرش بکاتە سەر سوپاکەی عەبدولرەحمان. سوپاکەی حەجاج لەهەمو قۆڵەکانەوە هێرشیان کرد و عەبدولرەحمان و سوپاکەی شکستیان خوارد و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی لەیلی فەقیە و ئەبولبەختەری تایی کوژران. بێستام کوڕی مەسقەلە کوڕی هوبەیرە هاوڕێ لەگەڵ چوارهەزار شەڕکەر لەخەڵکانی کوفە و بەسرە شەڕیان کرد و کاڵانی شمشێرەکانی خۆیان شکاند. ئەو هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ هاندا. بۆ چەندین جار هێرشیان کردە سەر خەڵکانی

شام و ریزەکانیان ئەوانیان تێکشکاند. حەجاج فەرمانی بەتیرهاوێژەکاندا تا تیربارانیان بکەن و خەڵکان ئەوانیان گەمارۆدا و جگە لەدەستەیەکی کەم هەمویان کوشتار کرد و کوڕی ئەشعەس بەناچاری روی لەسیستان کرد.

سەبارەت بەشکستی عەبدولرەحمان لەمەسکەن ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکەیش داوە: ئەوەی وتراوە ئەوەیە کە: ئەو و حەجاج لەمەسکەن کۆبونەوە. لەشکرگەی کوڕی ئەشعەس و حەجاج لەنێوان دیجلە و سەییب و کەرخ بو. ئەوان بۆ ماوەی مانگێك یا کەمتر شەڕیان کرد. دواتر پیرەپیاوێك رۆشتە لای حەجاج و ئەوی بۆ رێگەیەك لەپشت کەرخ لەناو دارستانێك کە تەنکە ئاوێك بو، رێنوێنی کرد. ئەو چوارهەزار پیاوی شەڕکەری لەگەڵ ئەو پیرەپیاوە رەوانە کرد و بەفەرماندەی ئەوانی وت: ئەگەر پیرەپیاو راستی کرد، هەزار درەمی پێ ببەخشە و ئەگەر درۆی کرد، بیکوژە. پیرەپیاو ئەوانی لەگەڵ خۆی برد. دواتر حەجاج بەشەڕ لەگەڵ سوپاکەی عەبدولرەحمان سەرقاڵ بو. حەجاج شکستی خوارد و هەڵات و لەروباری سەییب تێپەڕی. کوڕی ئەشعەس ئاسودە بۆ لەشکرگەکەی گەڕایەوە و لەشکرەکەی حەجاجی تاڵان کرد و هاوەڵانی کەرەستەی شەڕیان دانا تا بحەوێنەوە. نیوەکانی شەو لەناکاو بینیان شمشێری ئەو شەڕکەرانە گەمارۆیان خستونەتە سەر. لەهاوەڵانی عەبدولرەحمان زیاتر لەوەی بەشمشێر بکوژرێن لەناو ئاودا خنکان. حەجاج بەبیستنی دەنگ و هاواری شەڕکەران گەڕایەوە و سوپاکەی هەرکەسێکیان گرت، دەستبەجێ کوشتیان. ژمارەی کوژراوەکان چوارهەزار کەس بو و لەناو ئەوان: عەبداللە کوڕی شەداد کوڕی هاد، بێستام کوڕی مەسقەلە، عەمرۆ کوڕی زوبەیعەی رەقاشی، بشر کوڕی مونزەر کوڕی جارود و کەسانیتر.

## ڕەوانەبونی عەبدولرەحمان بۆ لای رۆتبیل

بەسەرهاتی ئەو و هاوەڵانی

کاتێك عەبدولرەحمان لەشەڕی مەسکەن هەڵات، حەجاج شوێنی کەوت و کوڕەکەی محەممەدی هاوڕێ لەگەڵ عومارە کوڕی تەمیمی لەخمی (بەسوپایەك بەفەرماندەیی محەممەد) بەدوای ئەودا رەوانە کرد. عومارە ئەوی لەشوش بینی و ماوەیەك شەڕی لەگەڵ ئەزمون کرد کە عەبدولرەحمان و سوپاکەی شکستیان خوارد و بەرێکەوتن تا گەیشتنە شاپوور. کوردەکان لەدەوری ئەو کۆبونەوە. عومارە لەگەردەنە بەقورسی شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد بەشێوەیەك خۆی و زۆر لەشەڕکەرانی سوپاکەی برینداربون. عومارە شکستی خوارد و عوقەبەی بەوان سپارد.

عەبدولرەحمان بەرێکەوت تا گەیشتە کرمان و عومارە بەهەمان شێوە بەدوایەوە بو. یەکێك لەخەڵکانی شام ڕۆشتە ناو کۆشکێك لەبیابانی کرمان کەنوسراوێکی بینی کەیەکێك لەخەڵکانی کوفە چەندین هۆنراوەی لەحارس کوڕی حیلزەی یەشکوری تیا نوسیبو. قەسیدەیەکی دوورودرێژە کە ئاماژە بەچەند دێڕێکی دەدەین:

| | |
|---|---|
| ایا لهفا و یا حزنا جمیعا | و یا حر الفواد لما لقینا |
| ترکنا الدین و الدنیا جمیعا | و اسلمنا الحلائل و البنینا |
| فما کنا اناسا اهل دین | فنصبر فی البلاء اذ ابتلینا |
| ترکنا دورنا لطغام علك | و انباذ القری و الاشعرینا |

یانی: ئەی هاوار و درێغ بۆ هەر پێشهاتێك کەروویدا، چەندە داغی دڵمان پێبڕا لەوەی رویدا. دین و دنیامان هەردوکی لەدەستدا و ژنان و منداڵەکانمان بەدوژمن سپارد. نە خەڵکێکی دینداربوین تا لەتاقی کردنەوە خۆڕاگری بکەینە پیشە نە پیاوانی شەڕ بوین تا خوێنی دوژمن بکەینە ناو شوشە. ماڵەکانی خۆمان بەریسوا و بێ سەروپێکانی (عەك) سپارد و گوندەکانمان تەسلیم بە ئەشعەریەکان و ئەنبات کرد.

کاتێك عەبدولرەحمان گەیشتە کرمان، کارگوزارەکەی هاتە لای و ئاگاداری کردەوە کە هۆکارەکانی پێشوازی کردنی ئەوی ئامادە کردوە. عەبدولرەحمان دابەزی و دواتر بەرەو

سیستان کۆچی کرد و ڕەوانەی زەرنج بو کە فەرماندارەکەی لەوێ بو. ئەو دەروازەکانی بەست و ڕێگەی لەڕۆشتنە ناوەوەی عەبدولرەحمان گرت. چەند ڕۆژێك مایەوە تا دەروازەکان بکاتەوە بەلام نەیتوانی. بەرەو بوست بەرێکەوت کە عەییاز کوڕی هێمیان کوڕی هشامی سەدوسی شەیبانی وەك فەرماندار لەوێ دانا بو. عەییاز پێشوازی لێکرد. کاتێك هاوەلانی حەوانەوە، عەییاز ئەوەی بەست و بڕیاریدا تەسلیمی حەجاجی بکات و ئەمان بۆ خۆی وەربگرێت.

ڕۆتبیل پاشای تورکەکان بیستبوی کە عەبدولرەحمان گەیشتوە. بەرەو ڕوی ڕۆشت تا پێشوازی لێ بکات. کاتێك عەییاز ئەوی گرت، ڕۆتبیل لەبوست دابەزی و پەیامی بۆ عەییاز ڕەوانە کرد کە: سوێند بەخوا ئەگەر کەمترین ئازاری ئەو بدەیت یا تەنانەت تاڵە مویەك لەتەناقەکەی بکەیتەوە، لێرە ناڕۆم تا تۆ و بنەماڵەکەت کوشتار بکەم و ژن و منالەکانت ئەسیر و سامانەکانتان وەك تالانی ببەم. عەییاز داوای ئەمانی لێکرد و عەبدولرەحمانی ئازاد کرد. عەبدولرەحمان بڕیاریدا عەییاز بکوژێت بەلام ڕۆتبیل ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت.

دواتر عەبدولرەحمان هاورێ لەگەل ڕۆتبیل ڕۆشتە سەرزەمینەکەی ئەو. ئەو ڕێزی لە عەبدولرەحمان گرت و پێگەی بەرز کردەوە. لەم کاتەدا دەستەیەکی فراوان لەتێکشکاوەکان لەهاوەلانی عەبدولرەحمان و فەرماندە و ئەو کەسانەی بەئەمانەکەی حەجاج ڕازی نەببون و لەگۆڕەپانێك دوژمنایەتی ئەویان کردبو، بەدوای عەبدولرەحمان بەرێکەوتن تا گەیشتنە سیستان. بەشەست هەزار پیاوی شەڕکەر ئەوانیان خەملاند. ئەوان لەزەرنج دابەزین و گەمارۆیان خستە سەر دانیشتوانی ئەوێ و نامەیان بۆ عەبدولرەحمان نوسی و بانگیان کرد و ئاگاداریان کردەوە کە مەبەستی خوراسانیان هەیە تا لەوێ هێز لەخزم و هۆزەکان وەربگرن و خۆیان بەهێز بکەن. ئەو گەیشتە لای ئەوان. پێشتر عەبدولرەحمان کوڕی عەباس کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب نوێژی لەگەل ئەوان دەخوێند تا عەبدولرەحمان گەیشت. کاتێك نامەکانی ئەوان بەدەستی عەبدولرەحمان گەیشت، بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت. ئەوان دەستیان بەسەر زەرنجدا گرت و بەرەو لای عومارە کوڕی تەمیم لەخەلکانی شام پێشڕەویان کرد. هاوەلانی عەبدولرەحمان پێیان وت: ئێمە لەپانتاییەکانی سیستانەوە بۆ خوراسان ببە. وتی:

یەزید کوڕی موهەلیب لەوێیە کە پیاوێکی بەهێز و بوێرە و پاشایەتی خۆی تەسلیمی ئێوە ناکات. ئەگەر بڕۆینە ئەوێ، شەڕمان لەگەڵ دەکات و خەڵکانی شام شوێن پێی ئێمە هەڵدەگرن و بەمشێوەیە خەڵکانی خوراسان و شام بۆ شەڕ لەگەڵ ئێوە یەك دەگرن. وتیان: ئەگەر بڕۆینە خوراسان، شوێنکەوتەکانمان زیاتر دەبن لەدوژمنەکانمان.

عەبدولرەحمان لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت تا گەیشتە هەرات. لەهاوەڵانی ئەو عوبەیدالله کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەمورەی قورەیشی لەگەڵ دوهەزار پیاوی شەڕکەر هەڵات. عەبدولرەحمان بەوانی وت: من لەپەناگە و شوێنێکی ئارام بوم تا ئەوەی نامەکانی ئێوە گەیشت و وتتان بۆ لای ئێمە وەرە چونکە ڕێکەوتوین بەرێبەری تۆ شەڕ لەگەڵ دوژمنان بکەین. من هاتم و ئێوە بۆچونتان لەسەر ئەوە ئارامی گرت بەرەو خوراسان بڕۆین چونکە گومانتان دەکرد لەدەوری من کۆدەبنەوە و بلاوەی لێناکەن. ئێستا عوبەیدالله کارێکی کرد کەخۆتان بینیتان. هەرکارێك پێتان خۆشە ئەنجامی بدەن چونکە من بۆ لای هاورێکەم دەگەرێمەوە.

دەستەیەك لەوان بلاوەیان لێکرد و دەستەیەك مانەوە. زۆرینەی سوپاکە لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی عەباس مانەوە و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس بۆ لای ڕۆتبیل گەڕایەوە و عەبدالله کوڕی عەباس بەرەو هەرات بەرێکەوت. لەوێ روبەروی روقادی ئەزدی بونەوە کەئەویان کوشت و یەزید کوڕی موهەلیب بۆ شەڕی ئەوان بەرێکەوت.

دەڵێن: کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەس لەمەسکەن هەڵات، عوبەیدالله کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەمورە ڕۆشتە هەرات و عەبدولرەحمان کوڕی عەباس ڕۆشتە سیستان. هەڵاتوانی سوپاکەی کوڕی ئەشعەس کۆبونەوە. ئەو لەگەڵ بیست هەزار شەڕکەر بەرەو خوراسان بەرێکەوت و لەهەرات دابەزی. روبەروی روقاد بونەوە و ئەویان کوشت. یەزید کوڕی موهەلیب کەسی بۆ لای ئەو رەوانە کرد و پەیامیدا کە:لەم سەرزەمینە فراوانە پانتایی دیکە بۆ تۆ هەیە و کەسانی کەم شکۆتر لەمن، بۆ شارێك کۆچ بکە کە فەرمانی منی لەسەر نەبێت چونکە من شەڕ کردن لەگەڵ تۆم پێ خۆش نیە، ئەگەر خوازیاری سامانیت، بۆت دەنێرم. وەڵامی دایەوە: ئێمە بۆ شەڕ یا مانەوە نەهاتوین بەڵکو کەمێك دەحەسێینەوە و کۆچ دەکەین و پێویستمان بەسامانی تۆ نیە.

عەبدولرەحمان کوڕی عەباس دەستی بەکۆکردنەوەی باج کرد. یەزید لەمە ئاگادار بویەوە. وتی: کەسێك بیەوێت بحەسێتەوە و کۆچ بکات باج لەخەڵك وەرناگرێت. یەزید بەرێکەوت و جارێکیتر پەیامی بۆ نارد کە: تۆ حەسایتەوە و قەڵەو بویت و باجت وەرگرت. ئەوەی کۆتکردەوە، لەگەڵ زیادەیەکیتر، بۆ تۆ بێت. لەشارەکەی من بڕۆ چونکە لەشەڕ کردن لەگەڵ تۆ بێزارم. عەبدولرەحمان تەنیا مەبەستی شەڕی بو. نامەی بۆ سوپاکەی یەزید نوسی و داوای لێکردن پەیوەستی ببن تا ئاسایشی هەردوجیهانیان پێببڕێت. یەزید لەم کارە ئاگادار بویەوە و وتی: چیتر بەگلەیی کردن چارەسەری ئەم کێشەیە ناکرێت. هێرشی کردەسەر و شەڕی لەگەڵ ئەزمون کرد هەرچەند شەڕێکی ئەوتۆ روینەدا و سوپاکەی عەبدولرەحمان بلاوەیان لێکرد بەلام خۆی و دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆڕاگریان کرد و شکستیان خوارد. یەزید فەرمانیدا شوێنی نەکەون. ئەوەی لەناو لەشکرگەکەی ئەودابو تالانیان کرد و چەندین ئەسیریان گرت کە ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: محەممەد کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص، عومەر کوڕی موسا کوڕی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر، عەباس کوڕی ئەسوەد کوڕی عەوف زوهری، هێلقام کوڕی نوعەیم کوڕی قەعقاع کوڕی مەعبەد کوڕی زورارە، فیروز حوصەین، ئەبونەلفەلەج کۆیلەی عوبەیدالله کوڕی مەعمەر، سەوار کوڕی مەروان، عەبدولرەحمان کوڕی تەڵحە کوڕی عەبدالله کوڕی خەلەف خوزاعی و عەبدالله کوڕی فوزالەی زەهرانی ئەزدی.

عەبدالله کوڕی عەباس ڕۆشتە سند و کوڕی ئەبی سەمورە بۆ مەرو. یەزید بۆ مەرو گەڕایەوە و ئەسیرەکانی بەسەبرە و ئەجدە بۆ لای حەجاج رەوانە کرد. کاتێك ویستی ئەوان رەوانە بکات، براکەی حەبیب وتی: تۆ کە عەبدولرەحمان کوڕی تەڵحە رەوانە دەکەیت، چۆن دەتوانیت سەیری خەڵکانی یەمان بکەیت؟ یەزید وتی: ئەو حەجاجە، زیان بەو ناگەیەنێت. حەبیبوتی: ئەگەر تۆی لەسەر کارەکەت لابردوە، ئەو رەوانە مەکە چونکە چاکەی زۆری لەگەڵ ئێمە کردوە و ماف لەملی ئێمەدایە. وتی: چ مافێك؟ وتی: باوکی تۆ یانی موهەلیبان بۆ سەد هەزار درەم لەمزگەوت زیندانی کرد کە تەڵحە ئەو برە پارەی بۆدا. یەزید ئەوی ئازاد کرد، هەروەها عەبدالله کوڕی فەزالەی رەوانە نەکرد چونکە ئەو لەخەڵکانی ئەزد بو بەلام کەسانیتری رەوانە کرد.

کاتێك ڕۆشتنە لای حەجاج، بەدەرگاوانەکەی وت: کاتێك داوای سەروەری ئەوانم کرد، فیروز بێنە لای ئێمە. ئەو پێش بناغەدانانی شاری واست، لەواست ئەلقەصەب ژیانی بەسەر دەبرد. بەدەرگاوانەکەی وت: سەروەری ئەوان بێنە لای من. بەفیروزی وت: هەستە و فیروز هەستا و ئەوی بردە لای حەجاج. حەجاج پێی وت: ئەی باوکی عوسمان بۆ لایەنگریت لەوان کرد؟ سوێند بەخوا نەگۆشتی تۆ لەوە، نەخوێنت. وتی: ئاژاوەیەکی سەراسەری بو کە هەمو خەڵکانی گرتەوە. حەجاج وتی: ئەندازەی سامانەکەت بۆ من بنوسە. فیروز وتی: کوڕە، بنوسە، هەزار هەزار و دو هەزار هەزار (سێ ملیۆن دینار یا دەرم). سامانێکی زۆری باس کرد. حەجاج وتی: ئەم سامانە لەکوێیە؟ وتی: لای من. وتی: بیدە بەمن. وتی: خوێنم پارێزراو دەبێت؟ وتی: سوێند بەخوا لێت وەردەگرم و دواتر خوێنت دەرێژم. وتی: سوێند بەخوا خوێن و سامانی خۆم پێکەوە لەیەك شوێندا کۆناکەمەوە. حەجاج فەرمانیدا و ئەویان دورخستەوە.

دواتر محەممەد کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاصی بانگ کرد و پێی وت: ئەی سێبەری شەیتان! ئەی گومڕاترین و یاخیترینی خەڵکان! لەبەیعەت لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە پەشیمان دەبیتەوە و خۆت دەکەیتە هاوشێوەی کەسانی وەك حسین کوڕی عەلی و عەبدالله کوڕی عومەر و دواتر لێدان لەچاووشێك دەدەیت. حەجاج بەردەوام بەگورز لەسەر و روخساری دەدا تا ئەوەی هەمو روخساری بەخوێن سوربو و سەرئەنجام فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. عومەر کوڕی موسای بانگ کرد و وتی: ئەی کۆیلەی ژنان! بەگورز لەسەر سەری ئەو کوڕی جۆلا زادە (عەبدولڕەحمان کوڕی ئەشعەس) دەوەستیت و هاوڕێ لەگەڵ ئەو لەگەرماو ساردی دەخۆیتەوە! عومەر کوڕی موسا وتی: ئەی سەروەر، ئاژاوەیەك بو کەچاکەکار و خراپەکاری گرتەوە و ئێمە کەوتینە ناوی و ئێستا خواوەند دەستی تۆی بەسەر ئێمەدا ئاوەڵا کردوە، ئەگەر لێمان خۆش بیت، لەچاکەکاری تۆیە و لەپێشی تۆ نیشان دەدات و ئەگەر سزامان بدەیت دەستەیەك ستەمکارت سزا داوە. حەجاج وتی: ئەوەی کە چاکەکار و خراپەکاری گرتۆتەوە، لەدرۆکانی تۆیە، تەنیا خراپەکارانی گرتەوە و چاکەکار لەوە رزگاری بو. بەڵام ئەوەی دان بەگوناحەکەتا دەنێیت، ئەگەری هەیە سودی تۆی تیا بێت. خەڵك هیوایان برد کە رزگاری بێت بەڵام حەجاج فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد. دواتر هێلقام کوڕی

نوعەیمی بانگ کرد و پرسی: گومان بکەین کوڕی ئەشعەس بەخواستەکەی خۆی دەگەیشت، تۆ چ هیوایەکت هەبو؟ وتی: هیوادار بوم سەرکەوتن بەدەست بێنێت و من بکاتە فەرمانڕەوای عێراق بەهەمان شێوە کە عەبدولمەلیك تۆی کردۆتە فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیە. فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. دواتر عەبدالله کوڕی عامری بانگ کرد. کاتێك ڕۆشتە لای ئەو، وتی: ئەگەر ڕزگارت بێت، چاوت بەبەهەشت ناکەوێت! وتی: خوا پاداشتی کوڕی موهەلیب بداتەوە. حەجاج پرسی: کوڕی موهەلیب چی کرد؟ عەبدالله وتی:

لانه كاس فى اطلاق اسرية    و قاد نحوك فى اغلالها مضرا

وقى بقومك ورد الموت اسرتة    و كان قومك ادنى عنده خطرا

یانی: ئەو لەئازاد کردنی بنەماڵەکەی خۆی پێشدەستی کرد و خەڵکانی موزێری دەست و پێ بەستراو بۆ لای تۆ ڕەوانە کرد. خەڵکەکەی تۆی بۆ سەرچاوەی مەرگ و نەمان ڕەوانە کرد و خەڵکەکەی خۆی ڕزگار کرد. خەڵکەکەی تۆ لای ئەو بەهایان کەمتر بو.

حەجاج سەری داخست وەك بڵێی ئەو وتەیە کاریگەری لەسەردانا. وتی: تۆ چ کارێکت بەوە هەیە؟ فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد. وتارەکەی بەهەمان شێوە لەناخی حەجاجدا مایەوە تا ئەوەی سەرئەنجام یەزیدی لەخوراسان لابرد و خستیە زیندانەوە.

فەرمانیدا فیروزیان بەدەم ئەشکەنجەوە کوشت. قامیشی سەرقەڵشاوی فارسیان بەجەستەیدا دەهێنا تا بروشێت و بریندار ببێت و دواتر سرکەیان پیادەکرد. کاتێك بینی زەمانی مەرگی نزیك بۆتەوە، بەئەشکەنجەدەرەکەی وت: خەڵك گومان دەکەن من کوژرام بەڵام من سامانێکی زۆرم لای خەڵکان هەیە کەهیچ کات تەسلیمی ئێوەی ناکەن. من نیشانی خەڵکان بدە تا بزانن کەزیندوم و سامانەکەم تەسلیمی ئێوە بکەن. حەجاجیان لەوتەکەی ئاگادار کردەوە. وتی: ئەو نیشانی خەڵك بدەن. ئەویان بردە دەروازەی شار. ئەو لەناو خەڵکان هاواری کرد: هەرکەس من دەناسێت، بمناسێت و هەرکەس نامناسێت، بزانێت کە من فیروزم. من سامانم لەدەستی کەسانێك هەیە. هەر کەس شتێکی منی لایە، بۆ خۆی چونکە لەقەرزەکەی خۆم خۆش بوم و نابێت یەك

درەمی بەکەس بدات. ئەوانەی لێرمن ئەم پەیامە بەکەسانیتر بگەیێنن. حەجاج فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد.

دوبارە فەرمانیدا کە عومەر کوڕی ئەبی قورەی کێندیان کوشت. ئەو پیاوێکی ڕێزدار بو. ئەعەشی هەمەدانی بانگ کرد. پێی وت: ئەی دوژمنی خوا، ئەو قەسیدەیە بۆ من بخوێنەرەوە کە تیادا وتبوت ( بین الاشج و بین قیس باذح). وتی: ئەو قەسیدەیە دەخوێنمەوە کە تایبەت بەتۆ نوسیومە. حەجاج وتی: ئەوە بخوێنەرەوە. وتی:

| | |
|---|---|
| ابى الله الا ان يتمم نورة | و يطفى نار الفاسقين فتخمدا |
| و يظهر اهل الحق فى كل موطن | و يعدل وقع السيف من كان اصيدا |
| و ينزل ذلا بالعراق و اهله | لما نقضوا العهد الوثيق الموكدا |
| و ما احدثوا من بدعة و عظيمة | من القول لم تصعد الى الله مصعدا |
| و ما نكثوا من بيعة بعد بيعة | اذ ضمنوها اليوم خاسوا بها غدا |
| و جبنا حشاه ربهم فى قلوبهم | فما يقربون الناس الا تهددا |
| فلا صدق فى قول و لا صبر عندهم | و لكن فخرا فيهم و تزيدا |
| فكيف رايت الله فرق جمعهم | و مزقهم عرض البلاد و شردا |
| فقتلاهم قتلى ضلال و فتنة | و جيشهم امسى ذليلا مطردا |
| و لما زحفنا لابن يوسف غدوة | و ابرق منه العارضان و ارعدا |
| قطعنا اليه الخندقين وانما | قطعنا و افضينا الى الموت مرصدا |
| فكافحنا الحجاج دون صفوفنا | كفاحا و لم يضرب لذالك موعدا |
| بصف كان الموت فى حجزاتهم | اذا ما تجلى بيضه و توقدا |
| دلفنا اليه فى صفوف كانها | جبال شروري او نعاف فشهمدا |
| فما لبث الحجاج ان سل سيفه | علينا فولى جمعنا و تبددا |
| و ما زاحف الحجاج الا رايته | معانا ملقى للفتوح معودا |
| و ان ابن عباس لفى مرجحنة | نشبهها قطعا من الليل اسودا |
| فما شرعوا رمحا و لا جردوا طبى | الا انما لاقى الجبان فجردها |
| و كرت علينا خيل سفيان كرة | بفرسانها و السمهرى مقصدا |
| و سفيان يهديها كان لواءها | من الطعن سند بات بالصبغ مجسدا |

| | |
|---|---|
| كهول و مرد من قضاعة حوله | مساعير ابطال اذا النكس عردا |
| اذا قال شدوا شدة حملوا معا | فانهل خرصان الرماح و اوردا |
| جنود امير المومنين و خيله | و سلطانه امسى عزيزا مويدا |
| فيهنى امير المومنين ظهوره | على امة كانوا سعاة و حسدا |
| نزوا يشتكون البغى من امرائهم | و كانوا هم ابغى البغاة و اعندا |
| وجدنا بنى مروان خير ائمة | و افضل هذا الناس حلما و سوددا |
| و خير قريس فى قريش اورمة | و اكرمهم الا النبى محمدا |
| اذا ما تدبرنا عواقب امره | وجدنا امير المومنين مسددا |
| سيغلب قوما حاربوا الله جهرة | مريضا و من والى النفاق و الحدا |
| كذاك يضل الله من كان قلبه | و ان كايدوه كان اقوى و اكيدا |
| و قد تركوا الاهلين و المال خلفهم | و بيضا عليهن الجلابيب خردا |
| يناديهم مستعبرات اليهم | و يذرين دمعا فى الخدود و اثمدا |
| انكثا و عصيانا و غدرا و ذلة | اهان الاله من اهان و ابعدا |
| لقد شام المصرين فرخ محمد | بحق و ما لاقى من الطير اسعدا |
| كما شام الله النجير و اهله | بجد له قد كان اشقى و انكدا |

یانی: خواوەند خوازیاری هیچ کارێك نیە و هەر کارێك ئەنجام بدات مەگەر ئەوەی زۆرینەی تیشکی خۆی بلاو بکاتەوە و روناکی خۆی بەهەمو شوێنێك بگەیێنێت و روناکی خراپەکاران بکوژێنێتەوە بەشێوەیەك خۆی دابمرکێتەوە. ئەوانەی بەدوای راستی و دروستی دەگەرێن، لەهەمو شوێنێك سەرکەوتویان دەکات و بەشمشێر سەری یاخیان دەپەرێنێت. ریسوایی بەسەر خەڵکانی عێراق دابارند لەبەر ئەوەی پەیمانە بەهێزەکانی خۆیان شکاند، چونکە کاری قێزەونی زۆریان ئەنجامدا و یاخی بون و هەڵیت و پڵیتیان هێنایە سەرزمان کە هیچ کامیان رێگەی ئاسمانی نەگرتەبەر، بەیعەتەکانیان یەك لەدوای یەك شکاند، ئەگەر ئەمرۆ بەیعەتێکیان پشت راست دەکردەوە، بەیانی پێشێلیان دەکرد و ترسێك کەخواوەند دڵی ئەوانی پێ لێوانلێو کرد بەشێوەیەك تەنیا بەترسەوە لەکەسێك نزیك دەکەونەوە. ئەوتارەکانیان راستی تیا دەبینرێت و نە لەکارەکانیاندا خۆراگرن، ئەوەی هەیانە، تەنیا شانازی کردنە بەخۆ و زیاد ویستن. ئێستا بینیت خواوەند چۆن

ئەوانی پرژ و بڵاو کردەوە و ئەوانی لەناو برد و بۆ هەمو سەرزەمینەکان دوریخستنەوە. کوژراوەکانی ئەوان کوژراوی گومڕایی و ئاژاوەن و سوپاکەی ئەوان نیشانەیەك بۆ ریسوایی و لاوازی. کاتێك بەرەبەیان بۆ لای کوڕی یوسف پێشڕەویمان دەست پێکرد و دو کوڵمی سوربونەوە و هەورە بروسەکەیان لێ بەرزبویەوە، دو سەنگەرەکەمان بۆ لای ئەو بڕی، نەڕۆشتینە لای ئەو بەڵکو بەرەو مەرگێك کە لەسەر رێگا دانیشتبو، بەرێکەوتین. حەجاج لەناو ریزەکانمان شەڕی لەگەڵ ئێمە ئەزمون کرد: شەرێکی پیاوانەی کرد و بەڵێنی بەهیچ کەسێك نەدا. لەگەڵ دەستەیەك کەوەك بڵێی نیشانی مەرگیان لەسەر ئالآکانیان بەستبو و ئەمە لەکاتێکدا بو خودەی ئاسنینی ئەو وەك هەتاو دەستی بەدرەوشانەوە کرد. هاورێ لەگەڵ ریزەکان پێشڕەویمان کرد کە لەخۆڕاگریدا هاوشێوەی کێوەکانی شەرورا یا نێعاف یا شەهمەد بون. ئەوەندەی نەخایاند حەجاج تیغە تیژەکەی خۆی دەرکێشا بەشێوەیەك ریزەکانی ئێمە تێکشکان و هەڵاتن. هەرجار کە حەجاج هێرشی برد، ئەوم بەپیاوێك بینی کە مەبەستێکی گەورەی هەیە، ئەندێشەیەکی بەهێز و دڵێك بۆ سەرکەوتنێکی هەمیشەیی. کوڕی عەباس هاورێ لەگەڵ سوپایەکی شەرکەری سەرکوتکەر گەیشت کەتەنیا دەتوانین بە بەبەشێك لەشەوی تاریکی بشوبهێنین. نە رمیان بەرز کردەوە و نە شمشێریان لەکاڵآن دەرکێشا. پیاوی لاواز چاوی پێیکەوت و گیانی لەجەستەی سەند. سوپاکەی سوفیان هێرشیان کردە سەر ئێمە و سوارەکانی ئەوان بەشمشێرە دەرکێشراوەکان رویان لەئێمە کرد. سوفیان رێبەری ئەوانی دەکرد وەك بڵێی ئالآکەی ئەو لەزۆری خوێن رشتن، قوماشێکی رێ رێی یەمانی بو کە بەرەنگی شین تێکەڵ کرابو. پیرەکان و گەنجەکانی قوزاعە لەدەوری ئەو بون، پاڵەوانانی شەڕ بون کاتێك پیاوی لاواز هەڵبێت. کاتێك دەڵێت: یالآ، هەمو پێکەوە هێرش بەرن و رمەکان لەخوێنی خراپەکاران تێراو بکەن. سوپا و سوارەکانی سەروەری باوەڕداران کە پاشایەتیەکەی بەهێز و گەورە بو. نۆشی گیانی سەروەری باوەڕداران بێت دەرکەوتنی ئەو لەسەر ئەو خەڵکانەی خراپەخوازی یەکتر و دوزمان و رژدی بەرەکان بون. هەستان و لەستەمی فەرمانڕەواکەیان هاواریان بەرز کردەوە بەڵام خۆیان لەوان ستەمکارتر بون. ئێمە کوڕەکانی مەروانمان بەباشترین رێبەر بینی کە لەروانگەی خۆڕاگری و سەروەری، لەهەمو خەڵکان لەپێشترن. باشترینی قوڕەیش لەروانگەی نەژاد و بنەماڵە بون و

لەپێشترینی ئەوان. جگە لەپێغەمبەری ئێمە محەممەد کە کەس شیاو نیە بۆ بەرابەر کردن لەگەڵ ئەو. کاتێك لەئەنجامی کاری سەروەری باوەڕداران بڕوانین، ئەو بەپیاوێکی بەبڕشت دەبینین. بەزوویی تێکدەشکێن ئەوانەی بەئاشکرا شەڕی خوایان کرد و ئەگەر فێڵ لەگەڵ ئەو بکەن، ئەو بەبەهێزتر و چارەسازتر دەبینن. بەمشێوەیە کە خوا کەسێك کە دڵی نەخۆش بێت و دوورویی و بێ دینی بکاتە پیشە، گومڕایی دەکات. ئەوان کەسان و سامانەکانی خۆیان و ژنانی جەستە سپی کە جل و بەرگی بەزێرچنراو و شەرمەزاریان لەبەردابو، بەجێهێشت. ئەوانی بانگ کرد و ئەوان فرمێسکیان بەسەر کوڵمە ناسکەکانی خۆیاندا دەباراند. دەیانوت: ئایا پەیمان شکێنی و یاخیگەری و فریوکاری؟ ئەو کەسەی ئایینی خوا ریسوا بکات و پشت گوێی بخات، خوا ریسوایی دەکات و لەناوی دەبات. منداڵە گەنجەکەی محەممەد هەردو شارەکەی ریسوا و زەلیل کرد چونکە ئەوەی کرد لەروی راستی و دروستی بو و باڵندەی بەخت بو ئەوەی بەسەر سەریەوە سوڕا. بەهەمان شێوە کە خواوەند نوجەیر و بنەماڵەکەی ریسوا کرد و ئەمە لەزیانی باوەگەوڕێی ئەو بو کە بەشێوەیەکی بەدبەخت و چارەڕەش ژیا.

خەڵکانی شام وتیان: قسەیەکی جوانی کرد. خوا تەمەنی سەروەرمان درێژ بکات. حەجاج وتی: نا، چاکی نەوت. ئێوە نازان چە مەبەستێکی لەدڵدایە. دواتر وتی: ئەی دوژمنی خوا، سوێند بەخوا بۆ ئەم شێعرەت دەست خۆشیت لێ ناکەم، تۆنەمت لەتاو ئازار هێناوەتە سەرزمان چونکە ئەو سەرنەکەوت. مەبەستی ئەوەت کرد هاوەڵانت هان بدەیت. لەبەر ئەوەبو کە داوامان کرد ئەو قەسیدەیە بخوێنیتەوە کە دەڵێت (بین الاشج و بین قیس باذخ) ئەو قەسیدەکەی خوێندەوە و کاتێك گەیشتە ئەمە کە (بخ بخ لوالده و للمولود). حەجاج وتی: دوای ئەمە هیچ کات بەخ بەخ ناکەیت. فەرمانیدا و سەریان بڕی.

لەم قەسیدەدا وتی: کوڕی عەباس، مەبەستی عەبدولرەحمان کوڕی عەباس کوڕی رەبیعە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب بو کە ئاماژەمان پێدا. وتی: سوفیان، مەبەستی سوفیان کوڕی ئەبرەدی کەلبی لەفەرماندەی سوپاکەی شام. وتی: منداڵە گەنجەکەی محەممەد، مەبەستی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس بو. وتی: (اشج)، محەممەد کوڕی ئەشعەس مەبەستی بو. وتی: (بین قیس) مەبەستی

مەعقەل کوڕی قەیسی ریاحی و باوەگەورێی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس لەدایکەوە. وتی: (کما شام اللله النجیر و اهله بجدله) مەبەستی ئەوە بو کە ئەشعەس کوڕی قەیس باوەگەورێی عەبدولرەحمان ، دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەدینی ئیسلام هەڵگەڕایەوە و هۆزی کێندە شوێنی کەوتن و کاتێك موسوڵمانان شەڕیان لەگەڵ کردن و لەنوجەیر گەمارۆیان خستنەسەر، هەمویان گرت و کوشتاریان کردن کە باسی ئەم روداوەمان لەکاتی گێڕانەوەی شەڕ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان لەدین کرد.

## درێژەی داستان

دەڵێن: دو ئەسیریان بردە لای حەجاج کە فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد. یەکێك لەوان وتی: من مافێکم لای تۆ هەیە؟ وتی: چیە؟ وتی: رۆژێك عەبدولرەحمان بەخراپە ناوی دایکی تۆی برد و من رێگەی ئەو کارەم لێگرت. حەجاج وتی: چ کەسێك ئەمە دەزانێت؟ وتی: ئەم ئەسیرەیتر. حەجاج پرسیاری لێکرد و پیاو ئەوی بەراستگۆ زانی. حەجاج وتی: بۆ تۆ وەك ئەم پیاوە بەرگریت لەدایکی من نەکرد؟ وتی: ئایا راستی هیچ سودێك بەمن دەگەیەنێت؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەوەی رێگر بو لەو کارە، رقێکە کە لەتۆ و خەڵکەکەت لەدڵی مندایە. حەجاج وتی: هەردوکیان ئازاد بکەن. ئەمەیان لەبەر بەرگری کردن لەدایکی من و ئەویان لەبەر ئەوەی راستی هێنایە سەرزمان.

دەڵێن: پیاوێك لەئەنسار رۆشتە لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز و وتی: من فلاَن کوڕی فلاَنم. باوەگەورێی من لەرۆژی شەڕی بەدر کوژرا و باوەگەورێکەیترم لەشەڕی ئۆحۆد. ئەو رێزداری خەڵکەکەی خۆی باس کرد. عومەر لەعەنسەبە کوڕی سەعید کوڕی عاصی روانی و وتی: سوێند بەخوا رێزداری راستەقینە ئەمەیە نەك شەڕکردن لەرۆژی مەسکەن و رۆژی جەماجیم و رۆژی واهیت. ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

تلك المكارم لا قعبان من لبن      شيبا بماء فعادا بعد ابوالا

یانی: رێزداری ئەمانەیە نەك دو پیاڵە شیر کە تێکەڵ بەئاوی دەکەن و دەیخۆنەوە و دواتر دەیکەنە گمیز.

## بەسەرهاتی شەعبی لەگەڵ حەجاج

کاتێك سوپاکەی عەبدولرەحمان لەجەماجیم شکستیان خوارد، جارچیەکەی حەجاج جاریدا: هەرکەس پەیوەستی قوتەیبە کوڕی موسلیم بێت، ئەمانی پێ دەدرێت. حەجاج ئەوی کردبوە فەرمانداری ڕەی و موسلیم بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوتبو. خەڵکێکی زۆر پەیوەستی بون کەیەکێك لەوان شەعبی بو. ڕۆژێك حەجاج ئەوی بیرکەوتەوە و سەبارەت بەو پرسیاری کرد. یەزید کوڕی ئەبی موسلیم وتی: ئەو ڕۆشتۆتە ڕەی بۆ لای قوتەیبە. حەجاج نامەی بۆ قوتەیبە نوسی تا شەعبی ڕەوانە بکات و ئەو شەعبی بۆ لای حەجاج نارد.

شەعبی دەڵێت: کاتێك لەحەجاج نزیك بومەوە، چاوم بەیەزید کوڕی ئەبی موسلیم کەوت کە هاورێم بو و لەگەڵ ئەو راوێژم کرد. وتی: تا دەتوانی داوای بەخشین بکە. هاوڕێ و براکانیشم ئەم پێشنیارەیان بەمن کرد. کاتێك ڕۆشتمە لای حەجاج، شتێکی جیاواز لەوەم بینی کە باسیان کردبو. ڕۆشتمە لای و هاوشێوەی سەرومرێك سلاّوم لێکرد و وتم: ئەی سەرومری من، خەڵکان پێشنیاریان کردوە لەسەر بنەمای ئەوەی خوا دەیزانێت و راست و دروستە داوای لێخۆشبون بکەم بەلاّم سوێند بەخوا لێرەدا تەنیا راستی و دروستی دەهێنمە سەرزمان. سوێند بەخوا ئێمە دژی تۆ راپەڕین و کەسانی دیکەمان هاندا و هەوڵماندا، نەخراپەکارە بەهێزەکان بوین نەچاکەکارە خۆپارێزەکان، ئێستا خوا سەرکەوتنی بەتۆ بەخشیوە. ئەگەر سزا بدەیت، تاوانی هەڵە و گوناحەکانی خۆمانە و ئەگەر ببەخشیت، لەپێشی تۆ نیشان دەدات و جیاواز لەمانە، راستی بەزیانی ئێمە بەتۆیە.

حەجاج وتی: سوێند بەخوا تۆ لای من خۆشەویستتر لەو کەسانەیت کە دێنە لای ئێمە و خوێن لەشمشێرەکانیان دەچۆرێت و دەڵێن: مەگەر ئەو کارەمان نەکرد، مەگەر لەو شەڕەدا ئامادە نەبوین: ئەی شەعبی تۆ ئەمانت پێ بەخشراوە، ئاسودە بە. خەڵکت دوای ئێمە چۆن بینی؟ وتم: خوا تەمەنی سەرومرم درێژ بکاتەوە، دوای تۆ بێ خەوی و نائارامیم کردە سورمەی چاوم و لە هەرشوێنێك تەختاییم بەمەترسیدار بینی و ترسم کردە هاوتای خۆم و هاورێ باشەکانم لەدەستدا. و لەنێوە جێگرێکی باشترم بۆ کەسانی ونبوی خۆم دەست نەکەوت. وتی: ئەی شەعبی برۆ بەلای کارەکانی خۆتەوە. من گەڕامەوە.

## لەسەر کار لابردنی عومەر کوڕی ئەبی صەڵت لەرەی کردارەکانی ئەو

کاتێك حەجاج بەسەر کوڕی ئەشعەس سەرکەوت، خەڵکانێکی زۆر لەتێکشکاوەکان پەیوەستی عومەر کوڕی ئەبی صەڵت بون کە لەو پەرێشانیەدا، دەستی بەسەر شاری رەی دا گرتبو. کاتێك لەرەی کۆبونەوە، ویستیان کارێك بکەن تا لای حەجاج پێگەیان بەرز ببێتەوە و هەڵەی خۆیان لەجەماجیم پاك بکەنەوە. پێشنیاریان بەعومەر کرد حەجاج و قوتەیبە لەسەر کار لاببات. ئەو رازی نەبو. باوکیان لەم کارەدا بەشداری پێکرد کە پیاوێکی چاکەکار بو. ئەو پێشنیاری ئەم کارەی کرد و ناچاری کرد و پێی وت: کوڕی خۆم، ئەگەر ئەمان لەژێر ئاڵاکەی تۆدا بەرێکەون، ترسی ئەوەم نیە ئەگەر بەیانی بکوژرێیت. ئەو پێشنیارەکەی باوکی لەگوێ گرت.

کاتێك قوتەیبە لەرەی نزیك کەوتەوە، بەم هەواڵەی زانی و خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. روبەروی یەك بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد بەڵام هاوەڵانی عومەر پەیمان شکێنیان کردە پیشە. زۆربەیان لەخەڵکانی تەمیم بون. عومەر شکستی خوارد وبۆ تەبەرستان رۆشت و ئیسپەهبۆد پەنایدا و رێزی گرت وچاکەکاری لەگەڵ ئەو کردە پیشە. عومەر بەباوکی وت: تۆ منت بۆ یاخی بون دژی قوتەیبە و حەجاج ناچار کرد و من بەقسەم کردی هەرچەندە بۆچونی من و تۆ ناسازگار بو و من رازی نەبوم. ئێستا ئێمە لای ئیسپەهبۆد دابەزیوین، رێگە بدە پەلاماری بدەم و بیکوژم و دەست بەسەر وڵاتەکەیدا بگرم چونکە خەڵکانی پارس دەزانن ئەژادی من لەو بەرێزتر و لەپێشترە. باوك وتی: من ئەو کارە لەگەڵ پیاوێك ناکەم کە پەنای پێ بەخشین لەکاتێکدا ئێمە لەگیانی خۆمان دەترساین. ئەو رێزی لەئێمە گرت و لەماڵەکەی خۆی میوانداری کردین. عومەر وتی: تۆ لەنهێنیەکانی من ئاگادارتری.

قوتەیبە رۆشتە رەی و هەواڵی کارەکانی عومەر و هەڵاتنی ئەوی بۆ تەبەرستان بۆ حەجاج نوسی. حەجاج نامەی بۆ ئیسپەهبۆد نوسی و وتی: ئەوان یا سەری ئەوان بۆ من رەوانە بکە وگەرنە ئەمان لەسەر تۆ هەڵدەگیرێت. ئەسپەهبۆد خواردنی بۆ ئەوان ئامادە کرد و بانگێشتی کرد و عومەری کوشت و باوکی بەستەوە و بۆ لای حەجاج رەوانەی کرد. دەستەیەك دەڵێن: هەردوکیانی سەربڕی و سەری ئەوانی رەوانە کرد.

## بناغەدانانی شاری واستو لەم ساڵەدا حەجاج بناغەی شاری واستی دارشت.

پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بو کە حەجاج خەڵکانی کوفەی هاندا و فەرمانی ڕۆشتن بۆ خوراسانی پێدان و لەعەین حەمام لەشکری لێدا. لەو ڕۆژەدا گەنجێك لەخەڵکانی کوفە کە تازە بوکی بردبوە ماڵەکەی خۆی، شەوانە لەلەشکرگەکە گەڕایەوە و ڕۆشتە لای کچە مامەکەی خۆی. شەو کەسێك بەتوندی لەدەرگای ماڵەکەیدا ودەنگی بەرز کردەوە. پیاوێکی مەست لەخەڵکانی شام بو کە دەیویست ئازاری کچەکە بدات. کچە مامی ئەو پیاوە وتی: ئێمە لەم پیاوە دەترسین، هەمو شەوێك ئەم کارە دەکات. ئەو دەیەوێت ئازاری من بدات. من گلەییم بردە لای گەورەکان. پیاو بەژنەکەی وت: فەرمانی هاتنە ژورەوەی پێبدە. ژن ئەوی بردە ژور و پیاوەکە ئەوی کوشت. کاتێك بانگی نوێژی بەیانیان خوێند بۆ لەشکرگەکەی خۆی گەڕایەوە و بەکچە مامەکەی وت: کاتێك نوێژی بەیانیت خوێند، کەس بۆ لای خەڵکانی شام رەوانە بکە تا بێن و لاشەی هاورێکەیان ببەن. کاتێك تۆیان بردە لای حەجاج راستیەکان بڵێ و لەهەمو کارەکان ئاگاداری بکەرەوە.

ژن ئەو کارەی کرد و ئەویان بردە لای حەجاج و ژن لەهەمو شتێك ئاگاداری کردەوە. حەجاج وتی: راستت وت و کارێکی چاکت کرد. بەخەڵکانی شامی وت: هاورێکەتان بەخاك بسپێرن چونکە نەخوێنبایی هەیە نە تاوان، کوژراوی دەستی خوایە کە یەکراست دەڕواتە دۆزەخ. دواتر فەرمانیدا کەجاڕیاندا: کەس نەڕواتە سەر ماڵی کەسیتر.

حەجاج خەڵکانی شامی لەناو ماڵەکانی خەڵکانی کوفە جێ کردبویەوە. دوای ئەم فەرمانە، خەڵکانی شام هاتنەدەر و خێوەتیان هەڵدا. ئەو پێشەنگەکانی رەوانە کرد تا شوێنێکی شیاوی نیشتەجێ بون بدۆزنەوە کەناوی هەبێت. بەرێکەوت و لەشوێنی واست دابەزی. بینی خۆپارێزێك سوار لەسەر کەرێك دەگات. کاتێك گەیشتە شوێنی واست، کەرەکە میزی کرد و خۆپارێزی مەسیحی دابەزی و شوێنی میزەکەی هەڵکۆڵی و خۆڵەکەی هەڵگرت و خستیە ناو دیجلە. حەجاج سەیری دەکرد. وتی: ئەو بێننە لای من. پیاوەکەیان بردە لای. حەجاج وتی: بۆ ئەو کارەت کرد؟ وتی: لەنوسراوەکانی خۆماندا

دەبینین کە لەم شوێنەدا مزگەوێت دروست دەکرێت کە تا ئەو کاتەی یەك خواپەرەست لەسەر زەوی بمێنێت، لەو مزگەوتەدا پەرەستشی خوا دەکەن. حەجاج نەخشەی شاری واستی کێشا و مزگەوتەکەی لەهەمان شوێندا دروست کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

بەوتەی دەستەیەك، لەم ساڵەدا عەبدولەلیك ئەبان کوڕی عوسمانی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و هشام کوڕی ئیسماعیلی لەجێگەی ئەودانا. فەرمانداران لەم ساڵەدا ئەو کەسانە بون کەپێشتر ئاماژەمان پێدان.

دەڵێن: حەجاج لەترسی عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەس ژن و منالەکانی خۆی بۆ شام رەوانە کردبو و خوشکەکەی زێنەب لەناویاندا بو کەنومەیر لەهۆنراوەکەی خۆی ئاماژەی پێداوە. کاتێك ئەشعەس شکستی خوارد، مژدەدەرێکی بەم هەواڵە بۆ لای عەبدولەلیك رەوانە کرد و نامەیەکی بۆ خوشکەکەی نوسی. زێنەب سوار لەسەر ئێستر بو کاتێك نامەکەی وەرگرت. ئێستر لەخش خشی کاغزەکە رەمی کرد و زێنەب کەوتە خوار و مرد.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: واسلە کوڕی ئەسقەع لە تەمەنی ١٠٥ ساڵی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٠٤/٨٥ زایینی لەتەمەنی ٩٨ ساڵیدا مرد. زێربن حوبەیش لەتەمەنی ١٢٢ ساڵی، ئەبو وایل شەقیق کوڕی سەلیمەی ئەسەدی کوفی کە لەساڵی یەکەمی کۆچی /٦٢٢ زایینی لەدایك ببو.

## رووداوەكانی ساڵی هەشتا و چواری كۆچی (٧٠٣ زایینی)

## كوژرانی كوڕی قەریە

لەم ساڵەدا حەجاج، ئەیوب كوڕی قەریەی كوشت. ئەو لەناو سوپاكەی كوڕی ئەشعەس دژی سوپاكەی حەجاج شەڕی كردبو. كاتێك كوڕی ئەشعەس شكستی خوارد، ئەیوب پەیوەستی حەوەشب كوڕی یەزید كارگوزاری حەجاج بو لەكوفە. حەجاج داوی ئەوی كرد. ئەیوب وتی: لەگوناحەكەی من خۆش بە و ژیانم پێ ببەخشە چونكە هیچ ئەسپێكی ڕەسەن نیە مەگەر ئەوەی هەندێ كات ڕەم بكات و هیچ بوێرێك نیە مەگەر ئەوەی گرفتاری هەڵە بێت. و هیچ تیغێكی تیژ نیە مەگەر ئەوەی ڕۆژێك لەرۆژان كول ببێت. حەجاج وتی: هەرگیز! بێ گومان تۆ ڕەوانەی دۆزەخ دەكەم. ئەیوب وتی: كەواتە ئاسودەم بكە چونكە هەست بەگەرمیەكەی دەكەم. حەجاج فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەركرد. كاتێك بەكوژراوی بینی، وتی: خۆزگە ئازادم دەكرد و گوێم لەقسەكەی دەگرت.

## گرتنی قەڵای نەیزەك لەبادغیس

لەم ساڵەدا یەزید كوڕی موهەلیب دەستی بەسەر قەڵای نەیزەكدا گرت. ئەو سیخوڕەكانی بۆ ئەو پانتاییە ڕەوانە كردبو تا لەبارودۆخ ئاگاداری بكەنەوە. كاتێك لەبارودۆخ ئاگادار بویەوە، بەرێكەوت و گەمارۆی خستەسەر و دواتر دەستی بەسەرداگرت و هەمو سامانەكانی ئەو دیارەی تالان كرد. ئەم قەڵایە یەكێك بو لەبەهێزترین و شكۆدارترینی قەڵاكان. هەرجار كە نەیزەك دەیبینی، وەك ڕێزگرتن سەری لەزەوی دەسو و نوێژی بۆ دەبرد.

كەعب كوڕی مەعدانی ئەشعەری بۆ وەسفی نەیزەك وتویەتی:

و بادغيس التى من خل ذروتها — عز الملوك فان شاجار او ظلما

مينيعة لم يكدها قبله ملك — الا اذا واجهت جيشا له وجما

تخال نيزانها من بعد منظرها — بعض النجوم اذا ما ليلها عتما

یانی: بادغیس ئەو شوێنەیە کەهەر کەس بڕواتە سەر بەرزاییەکەی، بەسەر پاشاکاندا زاڵ دەبێت وئەوسا ئەگەر بخوازێت ستەم دەکاتە پیشە و ئەگەر بخوازێت دادپەروەری. بەهێزە، پێش ئەو هیچ پاشایەك مەبەستی ئەوی نەکردوە مەگەر ئەوەی ڕوبەڕوی سوپایەکی گەورە بۆتەوە. ئاگرەکان لەتاو بەرزی و گەورەیی هاوشێوەی کۆمەڵێك ئەستێرەن کە لەشەوی تاریك درەوشانەوەیان دەست پێکردوە.

ئەم قەسیدەیە چەندین دێری هەیە. هەروەها سەبارەت بەدەست بەسەرداگرتنی لەلایەن یەزیدەوە وتی:

| | |
|---|---|
| نفى نيزكا عن بادغيس و نيزك | بمنزلة اعيا الملوك اغتصابها |
| محلقة دون السماء كانها | غمامة ضيف زال عنها سحابها |
| و لا تبلغ الاروى شماريخها العلى | و لا الطير الا نسرها و عقابها |
| و ما خوفت بالذئب ولدان اهلها | و لانبحت الا النجوم كلابها |

یانی: ئەو نەیزەکی لەبادغیس دەرپەڕاند و قەڵای نەیزەك لەپێگەیەکدایە کەپاشاکان لەدەست بەسەرداگرتنی بێزار بون. لەنێوان زەوی و ئاسمان هەڵواسراوە، وەك پەڵە هەورێکە کەهەورەکەی پێوە نەماوەتەوە. بزنە کێوی ناتوانێت بگاتە بەرزاییەکەی و باڵندەکان لەسەرەوە ناتوانن هەڵبفڕن مەگەر لاشخۆر و هەڵۆ. منداڵی بنەماڵەکانی ترسیان لەهێرشی گورگ نیە و سەگەکان تەنیا بۆ ئەستێرەکان دەقروسکێنن.

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی دیکەی هەیە.

کاتێك دەستی بەسەرداگرت، ئەم هەواڵەی بۆ حەجاج نوسی. دەبیرەکەی ئەو یەحیا کوڕی یەعمەری عەدەوانی هاوپەیمانی هوزەیل بو. ئەو بۆ حەجاجی نوسی: ئێمە ڕوبەڕوی دوژمن بوینەوە و خوا دەستی ئێمەی بەسەر شانەکانی ئەوان ئاوەڵا کرد. دەستەیەکمان کوشت و دەستەیەکمان ئەسیر کرد و دەستەیەك بۆ سەر بەرزایی کوێستانەکان و ناو دۆڵەکان و دارستان و کەنارەکان ڕایان کرد. حەجاج پرسی: چ کەسێك دەبیری یەزیدە؟ وتیان: یەحیا کوڕی یەعمەر. حەجاج فەرمانیدا یەحیا سوار لەسەر ئەسپی پەیکەکان ڕەوانەی لای ئەوی بکەن. هاوشێوەی کەسێکی زمان پاراو و فەرەزان ڕۆشتە لای حەجاج. حەجاج وتی: زادەی کوێییت؟ یەحیا وتی: ئەهوازی؟ وتی: ئەم زمان پاراوییەت لەکوێوە بەدەست هێناوە؟ وتی: قسەکانی باوکمم لەبەر کرد کەپیاوێکی زمان

شیرین بو. حەجاج وتی: ئاگادارم بکەرەوە ئایا خەڵکانی عەنبەسە کوڕی سەعید لەوتەکانی خۆیان گرفتاری هەڵە دەبن؟ وتی: بەڵێ، زۆر. بەشێوەیەکی نهێنی کە وشەیەك کەم دەکەیتەوە و وشەیەك زیاد دەکەیت. حەجاج وتی: سێ رۆژ مۆڵەتت پێدەدەم ئەگەر دوای ئەو سێ رۆژە بتبینم خوێنت دەرێژم. ئەو بۆ خوراسان گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی عەبدولەلیك بۆ شەڕ لەگەڵ رۆمەکان رەوانە بو و دەستی بەسەر مەصیصەدا گرت و قەلایەکی بۆ دروست کرد و سێسەد پیاوی شەڕکەری لەوێ دانا و بناغەی مەزگەوتی داڕشت. پێشتر موسوڵمانان ئەو کارەیان ئەنجام نەدابو. لەم ساڵەدا هشام کوڕی ئیسماعیل لەگەڵ خەڵکان ئایینی حەجی بەجێهێنا. فەرمانداراکان کەسانی ساڵی پێشو بون. هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان لەئەرمەنستان شەڕی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدالله کوڕی حارسی نەوفلی لەبەبەی عومان کۆچی دوایی کرد. ئەو دانیشتوی بەسرە بو و لەرۆژگای پێغەمبەر(د.خ) چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕوداوەکانی ساڵی هەشتا و پێنجی کۆچی ( ٧٠٤ زایینی )

## لەناوچونی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس

کاتێك عەبدولرەحمان لەهەراتەوە ڕۆشتە لای ڕۆتبیل، عەلقەمە کوڕی عەمرۆ ئەودی پێی وت: نامەوێت لەگەڵ تۆدا بێمە ناو ئەوشارە چونکە بۆ تۆ و هاوڕێکانت دەترسم. سوێند بەخوا ئێستاکە حەجاج دەبینم نامە و پەیك و پەیامی بۆ ڕۆتبیل ڕەوانە کردوە و ئەوی لەنێوان ترس و هیوا پەرێشان کردوە. دەبینم کە تۆ بۆ لای حەجاج ڕەوانە دەکات یا هەموتان دەکوژێت. من پێنسەد پیاوی شەڕکەرم لەگەڵدایە کە لەسەر مەرگ پەیمانمان بەستوە. ئەو لەگەڵ عەبدولرەحمان نەڕۆشتە سەرزەمینەکەی ڕۆتبیل. دەیوت: ئێمە سوێندمان بۆ یەکتر خواردوە بڕۆینە ناو شارێك و خۆمان حەشار بدەین تا ئەمانمان پێدەبەخشن یا ڕێزدارانە گیان دەبەخشین. ئەو پێنسەد پیاوە مەودود خەڵکی بەسرەیان وەك فەرماندەی خۆیان دەستنیشان کرد و عومار کوڕی تەمیمی لەخمی هێرشی کردە سەر ئەوان. ئەوان خۆیان حەشاردا تا ئەمانی پێبەخشین و هاتنەدەر. عومارە پەیمانەکەی خۆی بردە سەر.

دوای ئەوە بەردەوام نامەکانی حەجاج دەگەشتە ڕۆتبیل: عەبدولرەحمان بۆ ئێمە ڕەوانە بکە و گەرنە سوێند بەو خوایەیی جگە لەو خوایەك نیە، هاوڕێ لەگەڵ هەزار هەزار پیاوی شەڕکەر سەرزەمینەکەی تۆ لەژێر سمی ئەسپەکانمان پێشێل دەکەین.

عەبدولرەحمان پیاوێکی تەمیمی لەگەڵدابو کە بەعوبەید کوڕی سوبەیعی تەمیمی ناویان دەبرد. ئەو بوبە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی ڕۆتبیل. قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس بە عەبدولرەحمانی برای وت: من لەپەیمان شکێنی ئەم پیاوە تەمیمیە دەترسم، بیکوژە. عوبەید ترسی ئەوی لێ نیشت و لەزیانی ئەو لای ڕۆتبیل دووزمانی کرد و ڕۆتبیلی لەحەجاج ترساند و هانیدا بۆ پەیمان شکاندن لە گەڵ عەبدولرەحمان و پێی وت: من پەیمانت لەحەجاج بۆ وەردەگرم کە بۆ ماوەی حەوت ساڵ کاری بەسەرزەمینەکەی تۆ نەبێت لەسەر ئەو بنەمای کە عەبدولرەحمان تەسلیم بەو بکەیت. ڕۆتبیل ڕازی بو. عوبەید بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتە لای عومار و لەکاروبارەکان ئاگاداری کردەوە و ئاماژەی بەو پەیمانە کرد کە بەڕۆتبیلی دابو. عومارە ئەوەی بۆ حەجاج نوسی

و ئەویش رازی بو. رۆتبیل سەری عەبدولرەحمان بڕی و بۆ حەجاجی نارد.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدولرەحمان گیرۆدەی نەخۆشیی سیل ببو کە لەزیانەکەی کرد و رۆتبیل کەسێکی رەوانە کرد کە پێش بەخاك سپاردن سەریان لەجەستەی جیا کردەوە و بۆ حەجاجی نارد.

دەستەیەکی دیکە دەڵێن: کاتێك رۆتبیل بۆ سەری کوڕی ئەشعەس لەگەڵ عومارە کوڕی تەمیمی لەخمی پەیمانی بەست، عومارە حەجاجی ئاگادار کردەوە و ئەو بۆ ماوەی دەساڵ باج و خەراجی لەسەرزەمینەکەی رۆتبیل وەرنەگرت. رۆتبیل کەسی بۆ لای عەبدولرەحمان و سی کەس کەس لەبنەماڵەکەی رەوانە کرد کە ئامادە بون و رۆتبیل ئەوانی زیندانی کرد و بۆ لای عومارە رەوانەی کردن. عەبدولرەحمان خۆی لەسەرەوەی کۆشکەکە فرێدایە خوار و مرد و عومارە سەری بڕی و رەوانەی حەجاجی کرد. حەجاج بۆ عەبدولمەلیکی نارد و ئەوی بۆ براکەی عەبدولعەزیز. شاعیرێك لەمبارەوە وتی:

هیهات موضع جثة من راسها          راس بمصر و جثة بالرجج

یانی: دورە جێگەی سەر لەپەیکەرەکەی، سەر لەمیسرە و پەیکەر لەشاری رەجج.

لەسەر کارلابردنی یەزید کوڕی موهەلیب لەخوراسان

دانانی براکەی موفەزەل کوڕی موهەلیب

لەم ساڵەدا، حەجاج یەزید کوڕی موهەلیبی لەفەرمانڕەوایەتی خوراسان لابرد.

پاڵنەر بۆ ئەم کارە ئەوە بو کە حەجاج جارێك وەك میوان رۆشتە لای عەبدولمەلیك. لەرێگا خۆپارێزێکی مەسیحی بینی. پێیان وت: ئەو ئاگاداری نهێنیەکانی داهاتوە. بانگی کرد وپێی وت: ئایا لەنوسراوەکانتان شتێك سەبارەت بەرۆژگاری ئێستای ئێمە دەزانن؟ وتی: بەڵێ. پرسی: ناو براوە یا وەسف کراوە؟ وتی: هەموی دەبینم، هەندێکیان بێ ناو و تەنیا وەسف کراون و هەندێکیان ناویان براوە بێ ئەوەی وەسفیان کرابێت. وتی: وەسف کردنی سەروەری باوەرداران بەچ شێوەیەك دەبینن؟ وتی: ئەو لەرۆژگاری خۆماندا دەبینین، پاشایەکی بەختەوەر، هەر کەس روبەروی ببێتەوە، لەناو دەچێت. پرسی: دوای ئەو؟ وتی: پیاوێك بەناوی وەلید دێتە سەر کار، دواتر پیاوێکی هاوناو لەگەڵ یەکێك لەپێغەمبەرەکان کاروبارەکان دەگرێتە دەست کە خەڵك لەبەخشندەیی ئەو سوود

وەردەگرن. وتی: ئایا دەزانی دوای من کێ دەبێتە فەرمانڕەوا؟ وتی: پیاوێك بەناوی یەزید؟ وتی: تایبەتمەندیەکانی دەزانیت؟ وتی: جگە لەوە هیچ نازانم. حەجاج گومانی کرد کە یەزید کوڕی موهەلیبە. بەرێکەوت و لە وتاری ئەو پیاوە ترسا بو. لەبەر ئەمە گەڕایەوە و نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و خراپەی یەزید و بنەماڵەکەی بەفراوانی باس کرد و ئاگاداری کردەوە کە ئەوان لایەنگری کوڕی زوبەیرن. عەبدولەلیك بۆی نوسی: شوێنکەوتنی ئەوان بۆ بنەماڵەی زوبەیر بەهۆکارێك بۆ سەرکۆنە کردنی ئەوان نازانم، پێبەند بونیان بەوان، ناچاریان دەکات گوێڕایەڵ و فەرمانبەرێکی باش بن بۆ من.

حەجاج جارێکیرت نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و ئاگاداری کردەوە کە ئەگەری هەیە ئەوان پەیمان شکێنی بکەن. عەبدولەلیك وەڵامی دایەوە: تۆ سەبارەت بە بنەماڵەی موهەلیب ئاماژەت بەچەندین بابەت داوە، پیاوێك بەمن بناسێنە کە شیاوی خوراسان بێت. ئەو قوتەیبە کوڕی موسلیمی ناوبرد؟ عەبدولەلیك نوسی: بیکە بە فەرمانڕەوا.

یەزید ئاگادار بویەوە کە حەجاج ئەوی لەسەر کار لابردوە. بەکەسەکانی خۆی وت: گومان دەکەن حەجاج چ کەسێك دەکاتە فەرمانڕەوای خوراسان؟ وتیان: پیاوێك لەهۆزی سەقیف. وتی: هەرگیز، فەرمان بۆ یەکێك لەئێوە دەنوسێت و کاتێك من دەڕۆمە لای، ئەو لەسەر کار لادەبات و پیاوێك لەقەیس بۆ ئەو کارە دەستنیشان دەکات، خۆزگە ئەو قوتەیبە کوڕی موسلیم بێت.

کاتێك عەبدولەلیك فەرمانیدا ئەو لەسەر کار لاببات، نەیویست سەرەتا بۆی بنوسێت کەئەوی لەسەر کار لابردوە. لەبەر ئەمە نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا موفەزەل کوڕی موهەلیب بکاتە جێگری خۆی و خۆی بگاتە لای حەجاج.

یەزید لەگەڵ حوزەین کوڕی مونزەری رەقاشی راوێژی کرد بۆ ئەوەی بزانێت چی بکات. حوزەین پێی وت: بمێنەرەوە و وا خۆت نیشان بدە کە نەخۆشیت و دواتر نامە بۆ سەروەری باوەڕداران بنوسە تا لەپۆستەکەی خۆت بتهێڵێتەوە چونکە ئەو چاکەخوازی تۆیە. یەزید وتی: ئێمە منالی بنەماڵەیەکین کە لەرێگەی فەرمانبەریەوە بۆ ئەم پێگە بەرز بوینەتەوە و لەبەر ئەمە من ناسازگاریم پێ پەسەند نیە. ئەو خۆی بۆ کۆچ کردن ئامادە کرد و چاوەڕوانی کرد. حەجاج نامەی بۆ موفەزەل نوسی: تۆم وەك فەرمانداری خوراسان دەست نیشان کرد. موفەزەل هانی یەزیدی دەدا بۆ ئەوەی زوتر بگاتە لای

حەجاج. یەزید پێی وت: حەجاج دوای من تۆ لەسەر کارەکەت ناهێڵێتەوە، ئەوەی ناچاری کردوە تۆ دەست نیشان بکات، ترس لەوەیە کە من دژی ئەو شۆڕش بکەم و خۆم بپارێزم. تۆ بەزوترین کات ئەمە دەبینیت.

یەزید لەمانگی رەبیع الثانی لەخوراسان هاتەدەر و حەجاج موفەزەلی برای بۆ ماوەی نۆ مانگ لە پێگەکەیدا هێشتەوە و دواتر ئەوی لەسەر کار لابرد.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری لەسەر کار لابردنی ئەوە بو کە کاتێك حەجاج لە عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەس ئاسودەبو، جگە لەیەزید و بنەماڵەکەی هیچ هۆکارێکی بۆ نیگەرانی نەدەبینی چونکە ئەو هەمو عێراقیەکانی (جگە لەبنەماڵەی موهەلیب و هاورێکانیان لەخوراسان) سەرکوت و دەستەمۆ کردبو. لەیەزید و کەسانی بۆ عێراق دەترسا و بەردەوام پەیامی بۆ دەنارد تا یەزید بڕواتە لای و ئەو کاروباری شەڕ و دوژمنی دەگردە بیانو. حەجاج نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و پێشنیاری پێکرد یەزید لەسەر کار لاببات چونکە بنەماڵەکەی ئەو شوێنکەوتەی کوڕی زوبەیرن. عەبدولەلیك وەلامی دایەوە (ئاماژەمان پێدا). حوزەین بەیەزیدی وت:

امرتك امرا حازما فعصيتنى          فاصبحت مسلوب الامارة نادما

فما انا بالباكى عليك صبابة          و ما انا بالداعى لترجع سالما

یانی: بۆ کارێکی دورئەندێشانە ئامۆژگاریم کردیت کە نافەرمانی منت کرد و گەشتیتە شوێنێك کە فەرمانڕەواییان لێ وەرگرتیتەوە و تۆیان پەشیمان پشت گوێ خست. نە هاورێیانە بۆ تۆ دەگریم و نە لەخوا دەپارێمەوە تەندروست بگەرێیتەوە.

دەڵێت: کاتێك قوتەیبە گەیشتە خوراسان، بەحوزەینی وت: چیت بەیەزید وت؟ وتی: پێم وت:

امرتك امرا حازما فعصيتنى          فنفسك اول اللوم ان كنت لائما

فان يبلغ الحجاج ان قد عصيه          فانك تلقى امره متفاقما

یانی: بۆ کارێکی دورئەندێشانە ئامۆژگاریم کردیت و نافەرمانی منت کرد. ئێستا ئەگەر سەرکۆنە دەکەیت، خۆت سەرکۆنە بکە. ئەگەر حەجاج هەواڵی پێ بگات کە تۆ نافەرمانیت کردوە، روبەروی کارێکی دژوار دەبیتەوە.

قوتەیبە وتی: چ ئامۆژگاریەکەت کرد وا نافەرمانی تۆی کرد؟ ئامۆژگاریم کرد کە

هەرچەندە زێر و زیوی دەست کەوتوە، هەڵیگرێت و بڕواتە لای سەروەرمان. دەستەیەك دەڵێن: قوتەیبە ئەوی بە پەرێشان بینی.

دەڵێن: حەجاج نامەی بۆ یەزید نوسی: بۆ شەڕی خارەزم بەرێکەوە. یەزید لەوەڵامدا نوسی: سامانەکەی کەمە و زیانەکەی زۆر. حەجاج نوسی: کەسێك وەك جێگری خۆت دەستنیشان بکە و وەرە بۆ لای من. نوسی: دەمەوێت بۆ شەڕی خارەزم بڕۆم. حەجاج نوسی: بۆ شەڕ لەخارەزم مەڕۆ چونکە بەو شێوەیە کە خۆت ئاماژەت پێدا. یەزید فەرمانی نەبرد وبۆ شەڕی خارەزم ڕۆشت و لەگەڵ خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی بەست و ئەسیری زۆری گرت و لەزستان مەبەستی گەڕانەوەی کرد. خەڵك بەسەرمایەکی سەخت گرفتار بون بەشێوەیەك جل و بەرگی ئەسیرەکانیان دادەکەند و لەبەریان دەکرد و ئەسیرەکان لەتاو سەرمان گیانیان سپارد. حەجاج بۆی نوسی: بگەرە لای من. ئەو دەڕۆشتە هەر شارێك، خەڵك بەگوڵ پێشوازیان لێدەکرد.

## کوژرانی موسا کوڕی عەبداللە کوڕی خازم

لەم ساڵەدا موسا کوڕی عەبداللە کوڕی خازم لەتەرموز کوژرا.

هۆکاری ڕۆشتنی بۆ تەرموز ئەوە بو کە باوکی چەندین کەسی لەبەنی تەمیم کوشت (پێشتر ئاماژەمان پێدا) لەبەر ئەمە زۆرینەی هاورێکانی لەدەوری ئەو بلاوەیان کرد. لەبەر ئەمە هاتەدەر و مەبەستی نەیشابوری کرد بەلام ترسا کە بەنی تەمیم هێرش بکەنە سەر سامانەکانی لەمەرو و تالانی بکەن. بەموسای کوڕی وت: سامانەکانی من هەڵگرە و لەروباری بەلخ تێپەڕە و پەنا بۆ یەکێك لەپاشاکان ببە یا روبکەرە قەڵایەك و لەوێ بمێنەرەوە. موسا لەگەڵ سەد و بیست سوار لەخەڵکانی مەرو هاتەدەر و کەسانیتر تا چوارسەد کەس پەیوەستی بون و خەڵکانێك لەبەنی سولەیم لەدەوری کۆبونەوە. ئەو ڕۆشتە زەم و شەڕی لەگەڵ خەڵکەکەی کرد و سامانێکی زۆری دەست کەوت و لەروبار تێپەڕی و بەرەو بوخارا بەرێکەوت و داوای لەفەمانڕەوای ئەو سەرزەمینە کرد پەنای بدات. فەرمانداری بوخارا رازی نەبو. لەو ترسا و وتی: پیاوێکی خوێنڕێژە و هاوەڵانی هاشێوەی خۆی. من لەوان دڵنیا نیم. شتێکی پێدا و رەوانەی کرد. دەڕۆشتە لای هەر پاشایەك، مانەوەی ئەوی پەسەند نەدەکرد. سەرئەنجام ڕۆشتە سەمەرقەند و لەوێ مایەوە. پاشاکەی تەرخون رێزی لێگرت و فەرمانی مانەوەی پێدا. موسا تا ئەو کاتەی

خوا ویستی، لەو سەرزەمینە مایەوە.

خەڵکانی سەغد سفرەیەکیان هەیە کە گۆشت و نان و قاپێك سەرکە و شەرابی لەسەر دادەنێن. ساڵانە بۆ پاڵەوانەکانی سەغدی رادەخەن بەشێوەیەك کەسیتر لەدەوری ئەو سفرەیە کۆنابێتەوە. ئەگەر کەسێك لەو سفرەیە بخوات، دەبێت روبەروی پاڵەوان ببێتەوە و هەرکەس رکەبەرەکەی خۆی بکوژێت، سفرەکە تایبەت دەبێت بەو. یەکێك لەهاوەڵانی موسا پرسی: ئەم سفرەیە چیە؟ ئەویان ئاگادار کردەوە و ئەو تورە هات و وتی: ئەی پیاوی عەرەب، دەبێت شەڕ لەگەڵ من دەست پێبکەیت. موسا شەڕی لەگەڵ کرد و ئەوی کوشت. پاشای سەغد وتی: فەرمانی مانەوەم پێدان و رێزم لێگرتن و ئێوە پاڵەوانەکەی منتان کوشت. ئەگەر ئەمانم پێ نەبەخشیبون، کوشتارم دەکردن. لەسەرزەمینەکەی من کۆچ بکەن. ئەوان کۆچیان کرد.

موسا ڕۆشتە کێش کە فەرمانڕەواکەی نەیتوانی روبەروی ببێتەوە و لەبەر ئەمە داوای هاوکاری لەتەرخون کرد. موسا هاورێ لەگەڵ حەوتسەد سوار شەڕی دەستپێکرد. شەڕیان کرد تا شەو داهات. لەیەك جیابونەوە و زۆربەی هاوەڵانی موسا بریندار ببون. ئەو بەزورعە کوڕی عەلقەمەی وت: لای تەرخون چارەیەك بۆ ئێمە بدۆزەرەوە. زورعە ڕۆشتە لای و وتی: ئەی پاشا، تۆ چ نیازێکت بەکوشتنی موسا و هاورێکانی هەیە؟ تۆ دەستت بەو ناگات مەگەر ئەوەی بەئەندازەی سوپاکەی ئەو لەهاوەڵانی خۆت بکوژرێت و ئەگەر موسا و هەمو شەڕکەرەکانی بکوژیت، هیچ سودێکت پێنابرێت چونکە ئەو لەناو عەرەبەکان پێگەیەکی بەرزی هەیە و هەرکەس بێتە خوراسان داوای خوێنی ئەو لەتۆ دەکات. پاشا وتی: ناتوانم کێش تەسلیمی ئەو بکەم. وتی: دەستی لێهەڵبگرە تا کۆچ بکات. ئەو دەستی لەموسا هەڵگرت.

موسا بەرێکەوت و ڕۆشتە تێرمێز. قەڵایەکی لەکەنار روبارەکە بینی. لەدەرەوەی قەڵاکە دابەزی و داوای لەپاشای تێرمێز کرد رێگەی چونە ناو قەڵاکەی پێبدات. تێرمێز پاشا رازی نەبو. موسا چەندین دیاری بۆ برد و بەچاکە هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد تا ئەوەی هاورێیەتیەکی گەرم لەناو ئەواندا دروست بو بەشێوەیەك پێکەوە دەڕۆشتن بۆ راو. تێرمێز پاشا خواردنێکی ئامادە کرد و بانگێشتی موسای کرد تا نانی لەگەڵ بخوات. موسا هاورێ لەگەڵ سەد کەس لەهاوەڵانی خۆی دەڕۆشتەدەر. ئەم جارەیش سەد کەس

لەهاوەڵانی خۆی هەڵبزارد و ئەوان پێکەوە ڕۆشتن و نانیان خوارد. کاتێك لەنان خواردن تەواو بون، وتی: لەپانتایی فەرمانڕەوایی من بڕۆ. موسا وتی: ناڕۆم تا ئەم قەلایە ببێتە ماڵی من یا گۆڕی من. لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و دەستەیەك لەوانی کوشتار کرد و کەسانیتر هەلاتن. موسا دەستی بەسەر ئەو قەلایەدا گرت و تێرمێز پاشای دەرپەڕاند بەلام زیانی لەخۆی و هاورێکانی نەدا. ئەوان ڕۆشتنە لای تورکەکان و داوای هاوکاریان لەوان کرد کەرازی نەبون و وتیان: شەڕ لەگەڵ ئەوان ناکەین. موسا لەتێرمێز مایەوە و دەستەیەك لەهاوەلانی باوکی لەدەوری کۆبونەوە و بەمشێوەیە بەهێز بو. بەردەوام هێرشی دەکردە سەردەوروبەری خۆی.

دواتر بوکەیر کوڕی وەساج وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەست نیشان کرا بەلام کاری بەموسا نەبو. ئومەییە هات و خۆی مەبەستی ناسازگاری لەگەڵ بوکەیری کرد و دواتر گەڕایەوە بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدرا. دوای ناشتی بوکەیر، ئومەییە پیاوێکی لەخوزاعە لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەشەڕکەران بۆ شەڕی موسا رەوانە کرد. خەڵکانی تێرمێز ڕۆشتنە لای تورکەکان و داوای هاوکاریان کرد وئاگاداریان کردنەوە کە دەستەیەك لەعەرەبەکان هێرشیان کردۆتە سەر سەرزەمینەکەیان و گەمارۆیان خستۆتە سەر. تورکەکان لەگەڵ دەستەیەکی فراوان ڕۆشتنە لای پیاوی خوزاعی. تورکەکان و هاوەلانی پیاوی خوزاعی، لەهەمو لایەکەوە گەمارۆیان خستە سەر موسا. ئەو لەسەرەتایی ڕۆژ لە گەڵ سوپاکەی خوزاعی شەڕی دەکرد ولەکۆتایی ڕۆژ لەگەڵ تورکەکان. بۆ ماوەی سێ مانگ لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد. دواتر بڕیاریدا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر سوپاکەی پیاوی خوزاعی. عەمرۆ کوڕی خالید کوڕی حوصەینی کەلابی پێی وت: باشترە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەیتە سەر عەجەمەکان چونکە عەرەبەکان وشیارترن و بۆ شەڕی شەوانە بوێرتر. کاتێك تورکەکانمان لەناوبرد، هێرش دەکەینە سەر عەرەبەکان.

ئەو لەشوێنەکەی خۆی مایەوە تا چەند کاتژمێرێك لەشەو تێپەڕی. موسا هاورێ لەگەڵ چوارسەد پیاوی شەڕکەر هاتەدەر و بە عەمرۆ کوڕی خالیدی وت: لەگەڵ ئێمە بەرێکەوە و لەگەڵ هاورێکانت لەنزیك ئێمە بمێنەرەوە. کاتێك بانگی تەکبیری ئێمەتان بیست، ئێوەیش تەکبیر بلێن. بەرێکەوت تا گەشتە سەر سوپای تورکەکان. بۆ لای

سوپاکەی خۆی گەڕایەوە ونەوانی بۆ چەندین دەستەی شەڕکەر دابەش کرد و هێرشی کردە سەر تورکەکان. کاتێك پاسەوانەکان ئەوانیان بینی، پرسیان کێن؟ وتیان: ڕێبوارین. کاتێك لەپاسەوانەکان تێپەڕیان کرد، تەکبیریان وت و هێرشیان کردە سەرتورکەکان. تورکەکان نەکەوتبونە خۆ کەبینیان شمشێر کەوتۆتە نێوانیان. کوتنە گیانی یەکی و کوشتاری یەکیان دەست پێکرد و سەرئەنجام هەڵاتن. لەموسوڵمانان شانزە کەس کوژران و ئەوان دەستیان بەسەر لەشکرگەی تورکەکاندا گرت و کەل و پەل و سامانێکی زۆریان دەست کەوت. خوزاعی و سوپاکەی شەویان کردە ڕۆژ و بەبینی ئەم کارە دڵگران بون و ترسان ئەو بەڵایش بەسەر خۆیاندا بێت. عەمرۆ کوڕی خالید بەموسای وت: تۆ تەنیا بەفرت و فێڵ دەتوانی لەم شەڕەدا سەرکەوتن بەدەست بێنیت چونکە هاوڕێیانی ئەو زۆر و سوپاکەی فراوانن. ڕێگە بدە بڕۆمە لای ئەو ئەگەری هەیە بتوانم فریوی بدەم. ئێستا لێم بدە و لەئازاردانی من دڵگران مەبە. موسا وتی: بەدوای لێداندا دەگەڕێیت و پێشوازی لەمەرگ دەکەیت؟ وتی: مەرگ و کوژران، ڕۆژانە ڕوبەڕوی دەبمەوە و بەڵام لێدان، زۆر ئاسانە لەبەرابەر ئەوەی بۆی دەگەڕێم. موسا پەنجا قامچی لێدا. عەمرۆ کوڕی خالید لەلەشکرەکەی موسا هاتەدەر و بەرەو لای سوپاکەی پیاوی خوزاعی بەڕێکەوت و داوای ئەمانی کرد و وتی: پیاوێکم لەخەڵکانی یەمەن کە لەگەڵ عەبداللە کوڕی خازم ڕۆژگارم بەسەر دەبرد. کاتێك کوژرا، هاتمە لای کوڕەکەی و بومە هاوڕێی ئەو. ئەو گومانی لەمن کرد و وتی: تۆ سیخوڕی بۆ دوژمنەکەی ئێمە دەکەیت. من لەمەرگ ترسام و هەڵاتم. پیاوی خوزاعی ئەمانی پێبەخشی و عەمرۆ کوڕی خالید لای ئەو مایەوە. ڕۆژێك ڕۆشتە لای ئەو و ئەوی بەتەنیا بینی بێ ئەوەی کەل و پەلی شەڕی پێبێت. بەشێوەیەکی چاکەخوازانە پێی وت: خوا سەروەرمان بپارێزێت، لەکاتێکی لەم شێوەدا نابێت کەل و پەلی شەڕ هاوڕێت نەبێت. وتی: کەرەستەی شەڕم هەیە. سوچی ڕاخەرەکەی خۆی بەرز کردەوە و شمشێرێکی بینی کە لەکالآن دەرکێشراوە. عەمرۆ شمشێرەکەی هەڵگرت و بەشێوەیەك لەپیاوی خوزاعیدا کەکوشتی و هاتەدەر و سوار ئەسپەکەی خۆی بۆ لای موسا گەڕایەوە. سوپاکە بڵاوەیان لێکرد و دەستەیەکیان داوای ئەمانیان کرد وپەیوەستی موسا بون کەئەمانی پێ بەخشین. ئومەییە کەسی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە نەکرد.

ئومەییە لەسەر کار لابرا و موهەلیب بوبە فەرمانداری خوراسان و خۆی گرفتاری موسا نەکرد و بەمناڵەکانی خۆی وت: ئاگادار بن هیچ کات دژی موسا نەوەستنەوە چونکە تا ئەم پیاوە بیرمەندە لەپێگەکەی خۆیدا بێت، ئێوە فەرمانڕەوای خوراسانن. ئەگەر کوژرا، پێش هەر کەسێك، فەرماندارێك لەقەیس دێتە خوراسان و مافەکانی ئێوە پێشێل دەکات. ئەویش خۆی گرفتاری موسا نەکرد.

موهەلیب، حورەیس کوڕی قوتبەی خوزاعی ئەشکەنجە کردبو. ئەو و براکەی سابت ڕۆشتنە لای موسا. کاتێك یەزید کوڕی موهەلیب هاتە سەرکار، سامانی ئەم دوانەی تالآن کرد و ژنەکانی ئەوانی فڕاند و براکەیان (لەدایکەوە) یانی حارس کوڕی مونزەری کوشت. سابت ڕۆشتە لای تەرخون و سکاڵای لەیەزید کرد. سابت لای تورکەکان خۆشەویست و ناو و ناوبانگی لەناو ئەواندا هەبو. تەرخون کینەی ئەوی لەدڵ گرت و نەیزەك و سەبل و خەڵکانی بوخارا و سەغدی لەبەرابەر یەزید ئامادە کرد و هێرشیان کردە سەر موسا. هەڵاتوانی سوپاکەی عەبدولرەحمان کوڕی عەباس لەهەرات و سوپاکەی کوڕی ئەشعەس لەعێراق لەدەوری موسا کۆبونەوە کە ژمارەیان دەگەشتە هەشت هەزار پیاوی شەڕکەر. سابت و حورەیس پێیان وت: بەڕێکەوە تا لەروبار تێپەڕی و یەزید لەخوراسان دەرپەڕێنیت و ئێمە تۆ بکەینە فەرمانڕەوای خۆمان. ویستی ئەو کارە بکات بەڵام هاوەڵانی پێیان وت: ئەگەر یەزید لەخوراسان دەرپەڕێنیت، سابت و براکەی دەست بەسەر ئەو سەرزەمینەدا دەگرن. ئەو بەڕێنەکەوت و بە سابت و حورەیسی وت: ئەگەر یەزید دەرپەڕێنین، فەرماندارێکی دیکە لەلایەن عەبدولەلیکەوە دێت. ئێمە کارگوزارانی یەزید لە (ماوەرا ئەلنەهر) دەردەپەڕێنین تا ئەم سەرزەمینە بکەوێتە سنوری فەرمانڕەوایەتی ئێمە. ئەوان کارگوزارەکانی یەزیدیان دەرکرد و دەستیان بەکۆکردنەوەی باج و سامانەکان و پێگە و هێزیان زیادی کرد بەشێوەیەك تەرخون و هاورێکانی گەڕانەوە و سابت و حورەیس کاروبارەکانیان هەڵدەسوڕاند و موسا تەنیا ناوی وەك فەرماندار مایەوە.

بەموسایان وت: تۆ هیچ کارێکت بەدەستەوە نیە و سابت و حورەیس هەرچیان بوێت، ئەنجامی دەدەن، ئەم دوانە بکوژە و خۆت هەڵسوڕانی کاروبارەکان بگرە دەست. موسا ڕازی نەبو بەڵام ئەوان ئەوندە پێداگریان کرد تا دڵی موسایان لەو دوانە پیس کرد

و مەبەستی کوشتنی ئەوانی کرد.

سەرفالّی ئەم کارە بون کە هەپتالیەکان و توبەیتیان و تورکەکان بەسوپایەکی حەفتا هەزار کەسی هێرشیان کردنە سەر. ژمارەیان بەرادەیەك زۆر بو کە ئەو کەسانەی خودەیان لەسەردا نەبو یا خودەکانیان تەخت بو، هەژماریان نەدەکردن و تەنیا ئەوانەی خودەی ئاسنینیان لەسەردابو، هەژمار کران. موسا کوڕی عەبداللە کوڕی خازم روبەرویان بویەوە و بەهاوکاری سوپاکەی شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد. پاشای تورکەکان لەگەڵ دەهەزار پیاوی شەڕکەر لەسەر تەپۆڵکەیەك وەستا و بەتەواوەتی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و شەڕ بەشێوەیەکی مەترسیدار بەردەوام بو. موسا وتی: ئەگەر ئەمانە کوشتار بکەن، ئەوانەی دیکە گرنگ نین. حورەیس کوڕی قوتبە هێرشی کردە سەر ئەوان و پێداگری کرد تا ئەوەی لەسەر تەپۆڵکەکە پاشەکشێی پێ کردن. زوبینێك بەرناوچاوانی حورەیس کەوت و هەردو سوپاکە لەیەك جیابونەوە. موسا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەرئەوان و براکەی خازم کوڕی عەبداللە کوڕی خازم هێرشی برد تا گەیشتە خێوەتی پاشاکەی ئەوان. ئەو بەدەسکی شمشێر لەپیاوێکی ئەوانیدا و ڕمێکی لەئەسپەکەی چەقاند. ئەسپەکەی ڕەمی کرد و پیاوەکەی خستە ناو روباری بەلّخەوە و پیاوەکە لەئاوەکەدا خنکا. لەتورکەکان ژمارەیەکی زۆر کوژران و ئەوانەی رزگاریان بو، مەینەتی و ڕەنجی زۆریان پێبڕا. حورەیس دوای دو رۆژ مرد.

موسا گەڕایەوە و سەرە بڕاوەکانی لەگەڵ خۆی هێنا و دو کۆشکی پێ دروست کرد. هاوەڵانی موسا وتیان: حورەیس کوژرا، سابتیش لەناو ببە. رازی نەبو. دەستەیەك لەوان ئەوەندە خراپەی سابتیان وت کە بەگوێی سابت گەیشت و ئەو محەممەد کوڕی عەبداللەی خوزاعی (مامی نەصر کوڕی عەبدولحەمید کارگوزاری ئەبو موسلیم لەشاری رەی) بۆ لەناو بردنی موسا بەشێوەیەکی نهێنی هەڵخراند. پێی وت: ئاگادار بە بەزمانی عەرەبی قسە نەکەیت وئەگەر لەتۆ بپرسن بڵێ لەئەسیرەکانم. ئەو کارەی کرد و پەیوەستی موسا بو و نۆکەری ئەوی دەکرد بەلاّم لەگەڵ ئەوەیشدا سیخوری بۆ سابت و لەکاروبارەکان ئاگاداری دەکردەوە. شەوێك موسا بەوانی وت: لەوەی دەبێتە هۆی لەناوچونی خۆتان، زۆربلەّیی مەکەن، من نامەوێت بەشێوەیەکی ناجوامێرانە لەگەڵ ئەو هەڵس و کەوت بکەم. بەگومانی ئێوە دەبێت چۆن لەناوی ببەم؟ براکەی نوح پێی وت:

کاتێك بەیانی دێتە لای تۆ، دەیبەینە یەکێك لەماڵەکان و پێش ئەوەی بەتۆ بگات، سەری دەبڕین. وتی: سوێند بەخوا ئەم کارە دەبێتە هۆی لەناوچونی ئێوە، بەڵام خۆتان باشتر دەزانن.

ئەوپیاوە ڕۆشتە لای سابت و لەکاروبارەکان ئاگاداری کردەوە. سابت شەوانە لەگەڵ بیست سوار بەرێکەوت و لەوێ دورکەوتەوە. بۆ بەیانی، نە سابتیان بینی، نە ئەو پیاوە. زانیان کە ئەو سیخوڕی بۆ سابت دەکرد.

سابت گەیشتە حوشرا و دەستەیەکی فراوان لەعەرەب و عەجەم لەدەوری کۆبونەوە. موسا هێرشی کردەسەر و شەڕی لەگەڵدا کرد و سابت لەقەڵای ئەو شارەدا سەنگەری گرت. تەرخون هاوکاری کرد و موسا بۆ تێرمێز گەڕایەوە و سابت و تەرخون و خەڵکی کێش و نەسەف و بوخارا لەگەڵ ئەم دوانەدا بون. ژمارەیان بەهەشتا هەزار پیاوی شەڕکەر خەمڵاند. گەمارۆیان خستە سەر موسا تا ئەوەی خۆی و هاوەڵانی بێزار بون. کاتێك بارودۆخیان دژوار بو، یەزید کوڕی هوزەیل وتی: سوێند بەخوا پیاوانە لەگەڵ سابت شەڕ دەکەم یا لەم ڕێگادا دەمرم. ئەو بەرەو لای سوپاکەی سابت بەرێکەوت و داوای ئەمانی کرد. زوهەیر پێی وت: من ئەم پیاوە باشتر لەتۆ دەناسم، تەنیا بە چەنەبازی هاتۆتە لای تۆ، ئاگات لەخۆت بێت. سابت دوکوڕەکەی یەزید کوڕی هوزەیلی (بەناوەکانی زەحاك و قەدامە) وەك بارمتە گرت و تەسلیمی زوهەیری کرد.

یەزید مایەوە و بڕیاریدا لەساتێکی لەناکاو یەزید ببینێت وهێرش بکاتە سەری و خوێنی بڕێژێت بەڵام نەیتوانی کارێك بکات تا ئەوەی یەکێك لەکوڕەکانی زیادی قەصیری خوزاعی مرد و سابت ڕۆشتە لای تا دڵنەوایی بکاتەوە، خۆر ئاوا ببو و ئەو کەرەستەی شەڕی هەڵنەگرتبو. یەزید لەسابت نزیك کەوتەوە و شمشێری لەناوچاوی دا کە تا مێشکی ڕۆشتە خوار. دواتر هەڵات و ڕزگاری بو. تەرخون دوکوڕەکەی یەزید (زەحاك و قەدامەی) گرت و کوشتی. سابت تا حەوت ڕۆژ زیندبو و دواتر مرد و دوای ئەو تەرخون کاروباری عەجەمەکانی هەڵدەسوڕاند. زوهەیر بەشێوەیەکی سست و لاواز کاروباری تایبەت بەهاوەڵانی سابتی هەڵدەسوڕاند بەشێوەیەك کە لەپچڕان و بڵاوبونەوە نزیك کەوتنەوە و موسا مەبەستی ئەوەی کرد شەوانە و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر ئەوان تا ئەوەی تەرخونیان لەمەبەستەکەی موسا ئاگادار کردەوە، تەرخون

پێکەنی و وتی: موسا ناتەوانتر لەوەیە بڕواتە گەرماو و خۆی بشوات، چۆن دەتوانێت شەوانە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر من؟ ئەمشەو کەس نەخەوێت.

موسا هاوڕێ لەگەڵ هەشسەد پیاوی شەڕکەر هاتەدەر و هاوەڵانی خۆی بۆ چەندین دەستەی شەڕکەر دابەش کرد و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر ئەوان. لای سوار و پیادە و چوارپێ تێندەپەڕین مەگەر ئەوەی بەڕم و شمشێر لێیان دەدا. نەیزەك کەرەستەی شەڕی پۆشی و خۆڕاگرانە وەستا و تەرخون پەیامی بۆ موسا رەوانە کرد خۆت و سوپاکەت دەست لەشەڕ هەڵبگرن چونکە ئێمە بەیانی لێرە دەڕۆین. موسا گەڕایەوە و تەرخون و عەجەمەکان هەموویان گەڕانەوە.

دوای ئەوە خوراسانیەکان دەیانوت: پیاوێکی وەك موسامان نەبینیوە و نەمانبیستوە، دو ساڵ شان بەشانی باوکی شەڕی کرد و دواتر بەناو شارەکانی خوراساندا گەڕا و هێرشی کردە سەر پاشایەك و دەستی بەسەر تەخت وتاجەکەی ئەودا گرت و دەربەردەری کرد. سوپای تورك و عەرەب هێرشیان کردە سەر بەڵام خۆی نەدۆڕاند چونکە لەسەرەتایی رۆژ لەگەڵ عەرەبەکان شەڕی دەکرد و لەکۆتایی رۆژ لەگەڵ تورکەکان.

موسا بۆ ماوەی پانزە ساڵ لەو قەڵایەدا مایەوە و ماوەرا ئەلنەهر کەوتە ژێر فەرمانی ئەو و کەس نەیتوانی بەرابەری یا روبەروی ببێتەوە.

کاتێك یەزید کوڕی موهەلیب لەسەر کار لابرا و براکەی موفەزەل کوڕی موهەلیب هاتە سەر کار، ویستی پێگەی لای حەجاج بەرز ببێتەوە و ئەم پێگەیە لەرێگەی شەڕ کردن لەگەڵ موسا کوڕی عەبدالله کوڕی خازم بەدەست بێنێت. عوسمان کوڕی مەسعودی بەسوپایەك بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد و بۆ مودەرێك کوڕی موهەلیب (کە لەبەلخ بو) نامەی نوسی و فەرمانی پێدا بۆ شەڕی موسا بەرێکەوێت. ئەو هاوڕێ لەگەڵ پانزە هەزار پیاوی شەڕکەر لەروبار تێپەڕی و نامەی بۆ تەرخون و سەبل نوسی کە پەیوەستی بون. گەمارۆیان خستە سەر موسا و خۆی و هاوەڵانیان بێزار کرد.

موسا بۆ ماوەی دو مانگ لەتەنگانەدا مایەوە. عوسمان بەدەوری خۆی سەنگەری هەڵکەند و ئامادە بو چونکە دەترسا موسا بەشێویەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەری. موسا بەهاوەڵانی خۆی وت: با شەڕ لەدەرەوە دەست پێبکەین، خۆڕاگری تاکەی! شەڕ لەگەڵ

ئەوان دەست پێبکەن یا سەردەکەون یا دەمرن. سەرەتا هێرش بکەنە سەر تورکەکان. ئەوان ڕۆشتنەدەر و موسا نەزر کوڕی سلێمان کوڕی عەبداللە کوڕی خازمی وەك جێگری خۆی لەشارەکە دەستنیشان کرد و پێی وت: ئەگەر کوژرام، شارەکە تەسلیمی عوسمان کوڕی مەسعود مەکە بەڵکو بەمودەرێك کوڕی موهەلیبی بسپێرە. ئەو هاتەدەر ویەك لەسەر سێی سوپاکەی بەرامبەر بەسوپاکەی عوسمان جێگیر کرد و پێی وتن: شەڕ لەگەڵ ئەو مەکەن مەگەر ئەوەی هێرش بکاتە سەرتان. مەبەستی تەرخون و سوپاکەی کرد و هێرشی برد. تەرخون شکستی خوارد و سوپاکەی موسا لەشکرگەکەی ئەویان گرت. تورکان و خەڵکانی سەغد هێرشیبان برد و لەنێوان موسا و قەلاّکە جیاییان دروست کرد. موسا لەشەڕ کردن بەردەوام بو. ئەسپەکەی ئەویان کوشت و موسا کەوتە سەر زەوی. بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی وت: من سوار ئەسپەکەی خۆت بکە. وتی: مەرگ ترسێنەرە، بەلاّم لەپشت سەری من سواربە چونکە ئەگەر رزگارمان بێت، هەمومان رزگارمان بوە ونەگەر لەناو بچین، هەمومان لەناو دەچین. موسا لەپشت سەری ئەو سوار بو. کاتێك پەڕیە سەر ئەسپەکە، عوسمان سەیری کرد و وتی: سوێند بەپەروەردگاری کەعبە ئەوە موسایە! هێرشی کردە سەر موسا. ئەسپەکەی ئەویان کوشت و موسا لەگەڵ کۆیلەکەی کەوت. ئەویان کوشت و جارچیەکەی عوسمان جاڕیدا: هەرکەسێکتان گرت، ئەسیری بکەن بەلاّم مەیکوژن.

لەو ڕۆژەدا ژمارەیەکی فراوان لەئەسیرەکان بەتایبەت لەعەرەبەکان کوژران. ئەو عەرەبەکانی دەکوشت و لەکۆیلەکانی ئەوانی دەدا و دواتر ئازادی دەکردن. پیاوێکی دڵڕەق وبێ بەزەیی بو.

ئەو کەسەی موسای کوشت، واسڵ کوڕی تەیلەسەی عەنبەری بو.

شارەکە لەدەستی نەزر کوڕی سلێمان مایەوە و تەسلیمی عوسمانی نەکرد بەڵکو بەدەستی مودەرێك کوڕی موهەلیبی سپارد کەئەویش ئەمانی پێبەخشی. مودەرێك شارەکەی تەسلیمی عوسمان کرد. موفەزەل نامەی بۆ حەجاج نوسی کە موسای کوشتوە. حەجاج وتی: هاوار لەم پیاوە! فەرمانی پێدەدەم ئەبو سەبرە بکوژێت و ئەو دەنوسێت کە بەرێگای خۆیدا ڕۆشتوە، دەنوسێت موسا کوڕی عەبداللە کوڕی خازمی کوشتوە. کوژرانی موسا ئەوی شادمان نەکرد چونکە ئەو لەخەڵکانی قەیس بو.

موسا لەساڵی ٨٥/ ٧٠٤ زایینی کوژرا. پیاوێك لەسوپاییەکان شمشێری لەقاچی موسادا. کاتێك قوتەیبە هاتەسەر کار، بەو پیاوەی وت: بۆ کاتێك جوامێری عەرەب کوژرا، شمشێرت لە قاچیدا؟ وتی: چونکە براکەمی کوشتبو. قوتەیبە فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

## مەرگی عەبدولعەزیز کوڕی مەروان

وەرگرتنی بەیعەت بۆ وەلید کوڕی عەبدولمەلیك

عەبدولمەلیك کوڕی مەروان دەیویست جێگری و خەلافەت دوای خۆی بەبراکەی یانی عەبدولعەزیز نەسپێرێت و بۆ کوڕەکەی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك بەیعەت وەربگرێت. قەبیصە کوڕی زەوایب رێگەی ئەم کارەی لێگرت و وتی: ئەم کارە مەکە چونکە بەمشێوەیە ناوی خۆت بەشێوەیەکی خراپ دەزرێنیت، ئەگەری هەیە ئەو بمرێت و ئەم کارە بۆ تۆ ئاسان ببێت. عەبدولمەلیك دەستی لەمەبەستەکەی هەڵگرت بەلام بەردەوام ئارەزوی دەکرد ئەو لەسەر کار لاببات و کوڕەکەی بکاتە جێگری خۆی. رۆژێك روەح کوڕی زێنابع رۆشتە لای و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر ئەو لەسەر کار لاببەیت، تەنیا دو بزن لەسەر ئەم کارە شاخ لەیەك گیر ناکەن و من خۆم یەکەم کەس دەبم بەیعەت لەگەڵ کوڕەکەت دەبەستم. وتی: با بزانین بەیانی بەخواستی خوا چی پێشدێت. روەح لای عەبدولمەلیك خەوت. قەبیصە کوڕی زەوایب رۆشتە لای ئەو دوانە و بینی هەردوکیان خەوتون. عەبدولمەلیك دەرگاوانەکانی خۆی راسپاردبوو هیچ کات رێگری لەقەبیسە نەکەن. ئەنگوستیلە و مۆر و نیشانی سکە لەدەستی ئەودابو و نامە و هەواڵەکان پێش عەبدولمەلیك بەو دەگەیشت. کاتێك رۆشتە لای، سلاوی لێکرد و وتی: خوا پاداشتی عەبدولعەزیزی برات بداتەوە. وتی: ئایا مردوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/ ٢/ ١٥٦) دواتر روی کردە روەح و وتی: ئەوەی دەمانخواست، خوا بۆی ئامادە کردین و ئەمە بەریسوایی تۆ بو ئەی قەبیسە! قەبیسە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچونی راستە، چاوەڕوان بون و تێرامانە لەکارەکان. عەبدولمەلیك وەلامی دایەوە: هەندێ کات پەلە کردن دەبێتە هۆکارێك بۆ چاکیەکان، کاری عەمرۆ کوڕی سەعیدیت نەبینی، ئایا پەلە کردن لەو کارە باشتر نەبو لەچاوەڕوانی کردن؟

مردنی عەبدولعەزیز لەجەمادی الاوەل/ مەی ٧٠٤ زایینی لەمیسر بو. عەبدولمەلیك پانتایی فەرمانڕەوایی ئەوی پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایەتی عەبداللەی کوڕی کرد و ئەوی وەك فەرمانڕەوایی میسر دەستنیشان کرد.

دەستەیەك دەڵێن: حەجاج نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی و وەرگرتنی بەیعەت بۆ وەلیدی بیرخستەوە و بۆ ئەم کارە دەستەیەکی وەك نوێنەری خۆی بۆ لای عەبدولمەلیك رەوانە کرد. کاتێك عەبدولمەلیك مەبەستی ئەوەی کرد عەبدولعەزیز لەسەر کار لاببات و بەیعەت بۆ وەلید وەربگرێت، نامەیەکی بۆ عەبدولعەزیز نوسی و وتی: باشترە رێگە بدەیت دوای من برازاکەت کاروبارەکان بگرێتەدەست. ئەو رازی نەبو. عەبدولمەلیك دوبارە نامەی بۆ نوسی و وتی: خەلافەت بۆ تۆ بێت و دوای تۆ بۆ کوڕەکەم وەلید. عەبدولعەزیز بۆی نوسی: من لەکوڕەکەم ئەبوبەکر ئەوە دەبینم کە تۆ لەکوڕەکەت وەلید دەیبینی. عەبدولمەلیك بۆی نوسی تا وەلامدەرەوەی باج وسەرانەی میسر بێت. عەبدولعەزیز لەوەلامدا نوسی: ئەی سەروەری باوەڕداران من و تۆ گەشتوینەتە ساڵێك کە هیچ یەك لەبنەماڵەی ئێمە پێی ناگات مەگەر ئەوەی مانەوەی کەم بێت. ئێمە نازانین کاممان سەرەتا دەمرێت. ئەگەر دەتوانی کارێك بکە تا رۆژگاری ماوە لەتەمەنی من بەفیڕۆ نەدەیت. عەبدولمەلیك دڵی بۆی سوتا و دەستی لێ هەڵگرت و بەکوڕەکانی خۆی وەلید و سلێمانی وت: ئەگەر خوا بیەوێت، خەلافەت بەئێوە ببەخشێت، کەس ناتوانێت رێگری لێ بکات. کاتێك عەبدولعەزیز بەداواکەی عەبدولمەلیك رازی نەبو، عەبدولمەلیك سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: ئەی خوایە، ئەو پەیوەندی لەگەڵ من پچڕاند، لەناوی ببە.

کاتێك عەبدولعەزیز مرد، خەڵکانی شام وتیان: کاروبارەکان بۆ جارێکی دیکە کەوتە دەست سەروەری باوەڕداران. کاتێك هەواڵی مەرگی ئەو بە عەبدولمەلیك گەیشت، فەرمانی بەخەڵکدا تا لەگەڵ کوڕەکانی وەلید و سلێمان بەیعەت ببەستن. خەڵکان لەگەڵ ئەم دوانە بەیعەتیان بەست و عەبدولمەلیك ئەم فەرمانەی بۆ شارەکان نوسی. فەرمانداری مەدینە هشام کوڕی ئیسماعیل بو. داوای لەخەڵکانی مەدینە کرد بەیعەت ببەستن کەهەمویان ئەو کارەیان کرد جگە لە سەعید کوڕی موسەییب کە خۆی بەدور گرت و وتی: تا عەبدولمەلیك زیندوە، بەیعەت لەگەڵ کەس نابەستم. هشام لێیدا و ئەوی

بەشاردا گەڕاند تا ئەوەی گەشتە سەر تەپۆڵکەیەك کە لەوێ خەڵکانیان دەکوشت و لەداریان دەدان. دواتر ئەویان گەڕاندەوە و زیندانیان کرد. سەعید وتی: ئەگەر دەمزانی لەدارم نادەن، جل و بەرگم لەبەر نەدەکرد، بەڵام بەخۆمم وت، من لەدار دەدەن و دامدەپۆشن. ئەم هەواڵە بە عەبدولەلیك گەیشت، وتی: خوا هشام ناشیرین بکات، شیاو بو داوای بەیعەتی لێ بکات و ئەگەر رازی نەدەبوو، یا دەیکوشت یا ئازادی دەکرد. نامەی بۆ هشام نوسی وسەرکۆنەی کرد و وتی: سەعید مەبەستی نافەرمانی کردن و ناسازگاری کردن نیە.

سەعید لەگەڵ کوڕی زوبەیر بەیعەتی نەکردبو و وتبوی: بەیعەت ناکەم تا خەڵکان یەك کەس وەك خەلیفە هەڵبژێرن. جابر کوڕی ئەسوەد کارگوزاری کوڕی زوبەیر شەست قامچی لێدا. کوڕی زوبەیریان لەم کارە ئاگادار کردەوە کە نامەی بۆ جابر نوسی و سەرکۆنەی کرد و وتی: ئێمە کارمان بەسەعید چیە؟ دەست لەو هەڵبگرە.

دەستەیەك دەڵێن: بەیعەت وەرگرتن بۆ وەلید وسلێمان لەساڵی ٨٤/ ٧٠٣ زایینی بو بەڵام گێڕانەوەی یەکەم راسترە. ئەمە پێش گەڕانەوەی عەبدولعەزیز بو لەمیسر بۆ لای براکەی. کاتێك ماڵئاوایی لێکرد، عەبدولەلیك پێی وت: روخساری کراوەی خۆت نیشانی خەڵکان بدە و بەنەرمی هەڵس و کەوت بکە و میهرەبانی بکەرە پیشە کە لەمەبەست و ئارەزوەکانت نزیکت دەکاتەوە. بەجوانی بیر لەدەرگاوانەکەت بکەرەوە چونکە دەبێت یەکێك بێت لەکەسە نزیکەکانی تۆ چونکە ئەو زمان و روخساری تۆیە. کەس لەبەردەرگاکەت نەوەستێت مەگەر ئەوەی تۆ ئاگادار بکاتەوە کە ئایا بەبینینی رازی دەبیت یا نە. کاتێك دەرۆیتە ناو کۆڕەکان، وتار پێشکەش بکە تا عادەت بەتۆ بگرن و هاورێیەتی تۆ لەدڵی ئەواندا سەقامگیر و جێگیر ببێت. کاتێك روبەروی کارێکی دژوار دەبیتەوە، بەراوێژ کردن چارەسەری بکە چونکە ئەمە کلیلی چارەسەر کردنی کاروبارە دژوارەکانە. هیچ پیاوێك لەراوێژ کردن زیانی پێ ناگات. کاتێك رقی کەسێك لەدڵ دەگریت، سزاکەی دوابخە چونکە دوای چاوەڕێ کردن، بۆ ئەم کارە بەتواناتری تا گەڕاندنەوەی ئەو زەمانەی فەرمانەکەت دەرکردبو. ماڵئاوا.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا هشام کوڕی ئیسماعیلی مەخزومی لەگەڵ خەڵكان حەجی کرد. فەرمانداری رۆژهەڵات و عێراق، حەجاج بو.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان لەئەرمەنستان شەڕی کرد و هاوین و زستانی لەو سەرزەمینە بەسەر برد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەمرۆ کوڕی حورەیسی مەحزومی، عەبدالله کوڕی حارس کوڕی جەزی زەبیدی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٨٧/ ٧٠٦ زایینی یا ٨٨/ ٧٠٧ زایینی مرد، عەبدالله کوڕی عامر کوڕی رەبیعە هاوپەیمانی بەنی عودەی کە لەساڵی مردنی پێغەمبەر(د.خ) چوارساڵ تەمەنی بو.

## روداوەکانی ساڵی هەشتا و شەشی کۆچی( ٧٠٥ زایینی )

## مردنی عەبدولمەلیك

لەم ساڵەدا لەنیوەی شەوال/ ٩ ئۆکتۆبەری ٧٠٥ زایینی عەبدولمەلیك چاوی لەدنیا بەست. بەردەوام دەیوت: لەمانگی رەمەزان دەترسم چونکە لەم مانگەدا لەدایك بوم و لەم مانگەدا منیان لەشیر گرتەوە و لەم مانگەدا قورئانم کۆکردەوە و لەم مانگەدا بەیعەتیان لەگەڵ من بەست. لەبەر ئەمە لەنیوەی شەوال مرد وئەمە لەکاتێکدابو ترسی مردنی لەدڵدا نەبو. ساڵەکانی تەمەنی شەست یا شەست و سێ ساڵ بو. ماوەی خەلافەتی ئەو لەرۆژی کوژرانی کوڕی زوبەیر تا سەرەمەرگ، سیانزە ساڵ و چوارمانگ حەوت رۆژ کەم یا سیانزە ساڵ و پانزە رۆژ بو.

کاتێك نەخۆشیەکەی مەترسیدار بو، یەکێك لەپزیشکەکان وتی: ئەگەر ئاو بخواتەوە، دەمرێت. تینویەتی بێزاری کرد و بەوەلیدی وت ئاوم دەرخوارد بدە. وتی: هاوکاری مەرگی تۆ ناکەم. داوای لەفاتیمەی کچی کرد. وەلید رێگەی نەدا. وتی: یا رێگە بدە ئاوم پێ بدات یا تۆ لەسەر کار لادەبەم. وەلید وتی: ئێستا بیانوم نەما. کچەکە ئاوی پێدا و عەبدولمەلیك مرد. وەلید رۆشتە لای و فاتیمە لەسەر سەری دەگریا. وتی: سەروەری باوەڕدارانە چۆنە؟ وتی: باشترە. کاتێك رۆشتەدەر، عەبدولمەلیك وتی:

و مستخبر عنا یرید لنا الردی و مستخبرات و الدموع سواجم

یانی: پیاوێك کەسەبارەت بەئێمە پرسیار دەکات و خوازیاری لەناو چونی ئێمەیە و زۆرن ئەو ژنانەی پرسیاری ئێمە دەکەن و فرمێسك هاوشێوەی باران لەچاویان دەبارێت.

ئەو پێشنیاری بەکوڕەکانی خۆی کرد و وتی: داواتان لێدەکەم خواپەرەست بن چونکە بەهێزترین پەناگە ئەوە. دەبێت گەورەی ئێوە نەرمی لەگەڵ بچوکەکان بگرێتەبەر و بچوکەکان رێز لەماف گەورەکان بگرن. گوێ لەبۆچونەکانی موسلیمە بگرن چونکە ئەو سەروەری ئێوەیە کە پەنای بۆ دەبەن و ئەو قەڵغانی ئێوەیە کە لەپەنای ئەودا تیر دەهاوێژن. رێز لەحەجاج بگرن چونکە تەختی وتاردانی بۆ ئێوە رازاندەوە و سەرزەمینەکانی بۆ ئێوە دەستەمۆ کرد و ریسوایی بەدوژمنەکانتان بەخشی. کوڕەکانی (دایکی بەردە)بن، (رۆپوشێك لەموی ڕەش کە لەخۆیەوە دەناڵێنن بۆ ئەوەی بەزیان

بەدور بن) تا لەزیانی دوپشك بەدور بن. بوێرانە روبەروی شەڕەكان ببنەوە چونكە شەڕ كردن مەرگ نزیك ناكاتەوە. بۆ چاكەكاران وەك چەپكە گوڵ بن كە یاداشت و ناوی چاكە، چاكەكاری بەشێوەیەكی هەمیشەیی دەمێنێتەوە. بەخششەكانی خۆتان بەمناڵەكانی بنەماڵە لەپێشەكان ببەخشن چونكە باشتر دەیپارێزن و زیاتر لەكەسانیتر سوپاسی ئێوە دەكەن. لەگوناحی گوناحكاران خۆش بن و ئەگەر داوای بەخشینیان كرد، رازی ببن و ئەگەر دوبارە گوناحیان ئەنجامدا، سزایان بدەن.

كاتێك مرد، وەلید نوێژی لەسەر خوێند و لەدەرەوەی دەروازەی جابیە بەخاكیان سپارد. هوشام ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

فما كان قیس هلكه هلك واحد          و لكنه بنیان قوم تهدما

یانی: مەرگی قەیس مەرگی پیاوێك نەبو، بنەماڵەیەك بو كە رووخا.

وەلید وتی: بێدەنگ بە چونكە لەسەر زمانی شەیتان قسە دەكەیت، بۆ هاوشێوەی ئەوس كوڕی حەجەر نەتوت:

اذا مقرم منا ذرا حد نابه          تخمط منا ناب آخر مقرم

یانی: كاتێك گەورەیەك لەنێمە ماڵئاوایی لەجیهان كرد، گەورەیەكی دیكە دێتەسەر كار و جڵەوی كاروبارەكان دەگرێتە دەست.

دەستەیەك دەڵێن: سلێمان بو هۆنراوەی یەكەمی خوێندەوە، راستیەكەی ئەوەیە چونكە هوشام لەم كاتەدا تەمەنی تەنیا چواردە ساڵ بو. شاعیرانی وەك كەسیر عێزەت و كەسانیتر لەپرسەی عەبدولمەلیكدا شێعریان هۆنیەوە كەیەكێكیان بەم شێوەیە:

سقاك ابن مروان من الغيث مسبل          اجش شمالي يجود و يهطل

فما فى حياة بعد موتك رغبة          لحر و ان كنا الوليد نومل

یانی: ئەی كوڕی مەروان، خۆزگە بارانێكی خرۆشان و بەخشندە گەزەوی هەڵبكەنێت، بەسەر ئارامگاكەتا ببارێت. دوای تۆ ئارەزوی ژیانم نیە هەرچەندە وەلید هیوا و ئارەزوی ئێمەیە.

## نەژاد و بنەماڵە و هاوسەرانی عەبدولمەلیك

ناو و نەژادی بەمشێوە بو: باوکی وەلید عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی عاص کوڕی ئومەییە کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبد مەنافە.

دایکی عایشە کچی معاویە کوڕی موغەیرە کوڕی ئەبی عاص کوڕی ئومەییە بو.

بەلاّم هاوسەران و مناڵەکانی ئەو: سلێمان و مەروانی گەورە و دەرج و عایشە بون کەدایکیان ولادە کچی عەباس کوڕی جەزءکوڕی حارس کوڕی زوهەیر کوڕی خوزەیمەی عەبەسی بو، یەزید، معاویە، مەروانی بچوك، دەرج و دایکی کولسوم کەدایکیان عاتیکە کچی یەزید کوڕی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بو، هشام کە دایکی دایکی هشام کچی ئیسماعیل کوڕی هشام کوڕی وەلید کوڕی موغەیرەی مەخزومی کەناوی عایشە بو. ئەبوبەکری بەکار کەدایکی عایشە کچی موسا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله بو، فاتیمە کە دایکی دایکی موغەیرە کچی موغەیرە کوڕی خالید کوڕی عاص کوڕی هشام کوڕی موغەیرە بو، عەبدالله، موسلیمە، مونزەر، عەنبەسە، محەممەد، سەعید ئەلخەیر و حەجاج کە دایکیان (دایکانی منالّ) بو، هەمو مناڵەکانی نۆزدە کەس بون.

هاوسەرەکانی: شەقرا ءکچی موسلیم کوڕی حولەیسی تایی کەدایکی باوکی کچی عەبدالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب بو. دەستەیەك دەڵێن: یەکێك لەهاوسەرەکانی کچی عەلی کوڕی ئەبی تالبە کە ئەمە راست نیە.

## بەشێك لەشێوە و کردارەکانی ئەو

عەبدولمەلیك پیاوێکی بیرمەند، خاوەن کلتور، فرەزان، زانا و تێگەیشتو بو.

باوکی زیاد دەڵێت: فەقیهەکانی مەدینە چوار کەس بون: سەعید کوڕی موسەییب، عوروە کوڕی زوبەیر، قەبیسە کوڕی زوەیب و عەبدولمەلیك کوڕی مەروان. شەعبی دەڵێت: کەسم بیر نیە مەگەر لەو فرەزانتر بوم جگە لە عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کە سەبارەت بەهەرچی قسەم لەگەڵ کرد، بەزاناتر لەخۆمم بینی و هۆنراوەیەکم نەخوێندەوە مەگەر ئەوەی لەوبوارەدا زیاتر لەمنی دەزانی. جەعفەر کوڕی عوقەبەی خەتایی دەڵێت: بە عەبدولمەلیك کوڕی مەروانیان وت: خێرا پیر بویت. وتی: رۆشتنە سەر تەختی وتاردان و ترس لەهەڵە لەوتارەکانم خێرا پیری کردم.

عەبدولەلیك دەیوت: كەس نابینم لەخۆم بۆ فەرمانڕەوایی بەتواناتر بێت، كوڕی زوبەیر زۆری نوێژ دەخوێند و نوێژەكانی درێژ دەكردەوە و ڕۆژی زۆر دەگرت بەڵام لەبەر ئەوەی دەست وشك و ڕەزیل بو، شیاو نەبو بۆ فەرمانڕەوایی.

ئەبو میسهەر دەڵێت: لەنەخۆشی مردنەكەی بە عەبدولەلیك كوڕی مەروانیان وت: بەچ شێوەیەك خۆت دەبینی؟ وتی: بەشێوەیەك كە خوای گەورە دەفەرمێت: تاق و تەنیا بۆ لای من هاتن بەهەمان شێوە كەیەكەم جار ئێوەم ئافراند، ئەوەی بەئێوەم بەخشی، لەپشت سەری خۆتان بەجێتان هێشت، دەستەبەرەكانتان لەگەڵ ئێوەدا نابینم كەگومانتان دەكرد لەنێوان ئێوەدا شەریكن. كاروبارەكان لەدەست ئێوەدا نەما وئەوەی گومانتان دەكرد بەكەڵكی ئێوە دێت، ونبو و لەناوچو (ئەنعام/ ٩٤/٦) موفەزەل كوڕی فەزالە لەگێڕانەوەیەك لەباوكی دەڵێت: دەستەیەك لە عەبدولەلیك كوڕی مەروان فەرمانیان وەرگرت و ڕۆشتنە سەردانی و ئەمە لەكاتێكدا بو كە نەخۆشیەكەی دژوار و كۆیلەیەكی خەساو ئەوی خستبوە سەر سینەی خۆی. بەوانی وت: كاتێك هاتنە سەردانی من، كە ئەو دنیا باوەشی بۆ كردومەتەوە و ئەم جیهانە پشتی تێكردم. من كەوتمە بیری كارە هیوابەخشەكانم و زانیم شەرێك بوە كە لەكاتی دوربون لەكارە خراپەكان لەرێگەی خوادا كردومە. ئێستا پێشنیارتان پێدەكەم خۆتان لەدەربارە پیسەكانی ئێمە بەدور بگرن و بەدەوریدا مەسوڕێنەوە. سەعید كوڕی عەبدولعەزیز تەنوخی دەڵێت: كاتێك نەخۆشی مەرگ بەسەر عەبدولەلیك زاڵبو، وتی: درگاكانی كۆشكەكەی من بكەنەوە، پیاوێكی جلشۆری بینی كە جل و بەرگ دەشوات، وتی: خۆزگە جل شۆرێك دەبوم. سەعید كوڕی عەبدولعەزیز وتی: سوپاس بۆ خوا كە ئەوانی ئارەزومەندی پێگەكەی ئێمە كرد و ئێمە تەماحكاری سوتاوی پێگەكەی ئەوان نەكرد.

سەعید كوڕی بەشیر دەڵێت: كاتێك نەخۆشیەكەی عەبدولەلیك روی لەدژواری كرد، بەردەوام سەركۆنەی خۆی دەكرد و دەستی پەشیمانی لەناوچاوی دەسوو و دەیوت: خۆزگە بژێوی ڕۆژانەی خۆم ڕۆژ بەڕۆژ بەدەست دەهێنا و پەرستینی خوام دەكرد. ئەم داستانەیان بۆ كوڕی خازم گێڕایەوە، وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كەبەلایەكی بەسەر هێنان كە لەكاتی گیاندان ئارەزوی ڕۆژگاری ئێمە دەكەن و ئێمە لەكاتی مردن ئارەزوی پێگەی ئەوان ناكەین. مەسعود كوڕی خەلەف دەڵێت: عەبدولەلیك لەكاتی نەخۆشیدا

دەیوت: سوێند بەخوا حەزم دەکرد کۆیلەی پیاوێك لەتەهامە دەبوم و مەڕ و ماڵاتەکەی ئەوم لەسارا و کێوەکاندا دەلەوەڕاند و خۆم لەبنچینەوە هیچ شتێك نەدەبوم.

عیمران کوڕی موسا کوڕی موئەدەب دەڵێت: دەگێڕنەوە کاتێك نەخۆشیەکەی دژوار بو، وتی. ببمبەنە سەر بەرزاییەك. ئەویان بردە سەر بانی کۆشکەکەی. لەتاو پەشیمانی، ئاخێکی ساردی هەڵکێشا و وتی: ئەی جیهان، چەندە خۆش بویت! درێژەکەت کورتە و گەورەکەت ورد و ئێمە بەتەواوی شەیدا و فریوخواردوی تۆ. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

ان تناقش یکن نقاشك یار     ب عذابا لا طوق لی بالعذاب

او تجاوزفانت رب صفوح     عن مسیی ذنوبە کالتراب

یانی: ئەی خوایە، ئەگەر لێکۆڵینەوە بکەیت، لێکۆڵینەوەکەت ئەشکەنجە دەبێت و من توانایی بەرگە گرتنی ئەشکەنجەم نیە و ئەگەر لێمان خۆش بیت، پەروەردگارێکی بەخشندەییت و گوناحکارێك دەبەخشیت کە گوناحەکانی بەئەندازەی خاك و خۆڵی بیابانە.

دەگێڕنەوە کە معاویە ئەم هۆنراوەی خوێندەوە. بەڵێ شیاوە عەبدولەلیك بەمشێوەیە بترسێت چونکە کەسێك دەستنیشان کردنی کەسێکی وەك حەجاج یەکێك لەگوناحەکانی بێت، دەزانێت لەکاتی ڕۆشتن بۆ ئەو دنیا، روبەروی چ چارەنوسێك دەبێتەوە.

ڕۆژێك عەبدولەلیك بەسەعید کوڕی موسەییبی وت: ئەی باوکی محەممەد، چاکەکاری دەکەم و شادمان نابم و خراپە دەکەم و داخی بۆ ناخۆم. وتی: لەئێستادا دڵت بەتەواوی مردوە.

عەبدولەلیك یەکەم کەس لەئیسلامدابو پەیمان شکێنی کرد. ئاماژەمان بەبەسەرهاتەکەی لەگەڵ عەمرۆ کوڕی سەعیددا. یەکەم کەس بو دیوانی لەفارسیەوە گێڕایەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، یەکەم کەس بو ڕێگەی قسە کردنی خەڵکانی لەبەردەم خەلیفەدا گرت چونکە پێشتر دەهاتنە لای خەلیفەکان و قسە و باسی خۆیان لەگەڵ باس دەکردن، یەکەم کەس بو رەزیلی کردە پیشە چونکە زۆر دەست وشك بو وپێیان دەوت (شەونمی بەرد)، یەکەم کەس بو ڕێگەی فەرماندان بۆ ئەنجامدانی کاری چاکەگرت و

دوای گوژرانی کوڕی زوبەیر لەوتارەکەی خۆی وتی: لەمە بەدوا هەر کەس بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا ڕێنوێنیم بکات، دەیکوژم.

## خەلافەتی وەلید کوڕی عەبدولمەلیک

کاتێك عەبدولمەلیك کوڕی مەروانیان بەخاك سپارد، وەلید لەگۆڕستان گەڕایەوە و ڕۆشتە ناو مزگەوت و بەسەر تەختی وتاردان هەڵگەڕا و خەڵکان لەدەوری ئەو کۆبونەوە. وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە( بقرە /١٥٦/٢). خوا پشت و پەنای ئێمە بۆ پرسەی سەروەری باوەڕدارانە. سوپاسی خوا دەکەین کە فەرمانڕەوایی بەئێمە بەخشی، هەستنە سەرپێ و بەیعەت بکەن.

یەکەم کەس بو دڵنەوایی خۆی دایەوە و پیرۆزبایی لەخۆی کرد. یەکەم کەس بو بۆ وەرگرتنی بەیعەت هەستایە سەرپێ. عەبداللە کوڕی هومامی سەلولی دەیوت:

الله اعطاك التی لا فوقها و قد اراد الملحدون عوقها

عنك و یابی الله الا سوقها الیك حتی قلدوك طوقها

یانی: خوا بەتۆی بەخشی و لەو گەورەتر نیە، ناباوەڕان ویستیان نەهێڵن ئەو کارە بەتۆ بگات بەلاّم خواوەند تەنیا تۆی ویست و خەڵك گەردنبەندی رازاوەی ئەو کارەیان کردە ملی تۆ.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك وەلید ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان، سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەوەی خوا بیەوێت، کەس ناتوانێت ڕێگەی لێ بگرێت و ئەوەی خوا نەیەوێت کەس ناتوانێت بیهێنێتەدی. ئەمە فەرمانی خواوەند و لەسەر بنەمای زانستی نهێنی ئەوە. ئەوە فەرمانێکە خواوەند بۆ پێغەمبەران و هەڵگرانی تەختەکەی خۆی نوسی. ئەو بەرەو پێگەی چاکەکاران بەرێکەوت کە سەرپەرەستی ئەم خەڵکە بو و لەلایەن خواوە فەرمانی پێدرابو سەختگیری لەگومانکەران بکات و دڵنەوایی باوەڕداران و چاکەکاران بداتەوە و ئەوەی خوا لەچرا و ئالأکانی ئیسلام هەڵیکردوە، بەشەکاوەیی بهێڵێتەوە و ئەمە هاوشێوەی ئەنجامدانی ئاینی حەج لەسنورەکان و هێرش کردنە سەر دوژمنانە. نە لاواز بو نە کەمتەرخەمی کرد. ئەی خەڵکینە، بەڵێن بدەن فەرمانبەر و گوێڕایەڵ بن و لەگەڵ خەڵکان بمێننەوە چونکە دێو هاونشینی خەڵکانی تەنیایە. ئەی خەڵکینە، هەرکەس ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئێمە بگرێتەبەر، لەملی دەدەین و هەر کەس بێدەنگ بێت، بەدەردی خۆی

دەمرێت. دواتر هاتە خوار، خوێنرێژێکی ستەمکار بو.

## فەرمانداری قوتەیبە کوڕی موسلیم لەخوراسان و کارەکانی ئەو لەم ساڵەدا

لەم ساڵەدا قوتەیبە کوڕی موسلیم وەك کارگوزاری حەجاج لەخوراسان، بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە ئەو دیارە کەموفەزەل سوپاکەی بۆ شەڕ ئامادە دەکرد. قوتەیبە وتارێکی پێشکەش بەخەڵکان کرد و ئەوانی بۆ شەڕ هاندا. دواتر بەناو ئەواندا گەڕا و بەرێکەوت و ئەیاس کوڕی عەبدالله کوڕی عەمرۆی وەك سەرپەرەستی کاروباری جەنگی مەرو دەستنیشان کرد و عوسمان کوڕی سەعیدی کردە لێپرسراوی کۆکردنەوەی باج و خەراج.

کاتێك گەیشتە تالەقان، دێدارەکانی بەلخ لەدەوری کۆبونەوە و لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. لەروبار تێپەڕی کرد و پاشای چەغانیەکان بەدیاری و کلیلە زێرینەکان پێشوازی لێکرد و ئەوی بردە ناو سەرزەمینەکەی خۆی. قوتەیبە لەگەڵ ئەو بەرێکەوت و ئەم سەرزەمینەی پێ سپارد چونکە پاشای ئاخرون و شومان بەشێوەیەکی خراپ هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکرد.

قوتەیبە لەوێوە بەرەو ئاخرون و شومان بەرێکەوت کە سەرزەمینی تەخارستانە. پاشاکەی لەسەر بنەمایی بڕێك درەم یا دینار پەیمانی ئاشتی لەگەڵ کرد کە قوتەیبە رازی بو و دواتر بۆ مەرو گەڕایەوە و براکەی ساڵح کوڕی موسلیمی وەك جێگری خۆی لەسەر سوپاکەی دەستنیشان کرد. ساڵح دوای قوتەیبە، کاشان و ئورشتی گرت کە لەناوچەکانی فەرغانەیە. هەروەها دەستی بەسەر ئاخشکیت دا گرت کە شاری کۆنی فەرغانەیە. نەسر کوڕی سەیار لەگەڵ ئەودابو و بەشێوەیەکی بوێرانە شەڕی دەکرد.

دەستەیەك دەڵێن: قوتەیبە لەساڵی ٧٠٤/٨٥ زایینی هاتە خوراسان و سوپاکەی کۆکردەوە و لەئاخرون و شومان شەڕی کرد و دواتر بۆ مەرو گەڕایەوە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەم ساڵەدا مایەوە و لەروبار تێنەپەڕی و ئەمە لەبەر پەرێشانی کاروبارەکانی بەلخ بو چونکە دەستەیەك لەسنورەکانی ئەو ئاڵای شۆڕشیان هەڵکردبو و قوتەیبە روبەروی ئەوان بویەوە. یەکێك لەو کەسانەی بەئەسیری گرتی، ژنەکەی بەرمەك باوکی

خالیدی بەرمەكی بو. بەرمەك فەرمانداری نەوبەهار بو. ژن كەوتە دەستی عەبدالله كوڕی موسلیم برای قوتەیبە كە بێدرەنگ لەگەڵ ئەودا خەوت. دواتر خەڵكی بەلَخ لەگەڵ قوتەیبە ئاشتیان كرد و ئەو فەرمانی ئازاد كردنی ئەسیرەكانی دەركرد. ژنی بەرمەك بە عەبدالله‌ی وت: من لەتۆ دوگیانم. مەرگی عەبدالله نزیك كەوتەوە و ئەو پێشنیاری كرد منالی ناو سكی ژنەكە پەیوەستی بنەماڵەكەی بكەن و ژنەكە بۆ مێردەكەی بگەڕێننەوە. دەڵێن: منالەكانی عەبدالله كوڕی موسلیم لەرۆژگاری مەهدی لەكاتی هاتنی ئەو بۆ رەی ڕۆشتنە لای خالید و خوازیاری ئەو بون. موسلیم كوڕی قوتەیبە بەوانی وت: لەسەر ئێوە پێویستە ئەگەر بەپەیوەست كردنی ئەو بەخۆتان رازین، بەهاوسەرگیری ئەو رازی ببن. ئەوان بەرەلایان كرد. بەرمەك پزیشك بو.

## بیركردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا موسلیم كوڕی عەبدولەلیك لەسەرزەمینی رۆم شەڕی كرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەجاج یەزید كوڕی موهەلیبی خستە زیندان و حەبیب كوڕی موهەلیبی لەكرمان لەسەر كار لابرد و عەبدولەلیكی لەفەرماندەیی پاسەوانەكانی خۆی دورخستەوە.

لەم ساڵەدا هشام كوڕی ئیسماعیلی مەخزومی لەگەڵ خەڵك حەجی كرد. فەرمانڕەوای عێراق و سەراسەری رۆژهەڵات حەجاج كوڕی یوسف بو.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەم كەسانە مردن: ئوسید كوڕی زوهەیری ئەنساری، عەمرۆ كوڕی ئەبی سەلیمە كوڕی دایكی ئەبی سەلیمە، عەلقەمە كوڕی وەقاصی لەیسی كە چاوی بە پێغەمبەر(د.خ) كەوتبو، قەبیسە كوڕی زوەیبی خوزاعی كە لەساڵی یەكەمی كۆچی/ ٦٢٢ زایینی لەدایك بو و پێغەمبەر(د.خ) یەكەم خواردنی دەرخوارددا و ئەو فەقیهە و مۆرداری عەبدولەلیك بو، سەعید كوڕی زەیدی ئەنساری كە لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بو، سەلە كوڕی دایكی سەلە، عەبدالله كوڕی ئەبی ئەوفی ئەسلەمی كەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٠٦/٨٧ زایینی مرد و لەشەڕكەرانی خەیبەر و حودەیبیە بو و لەكۆتایی رۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بو، لاحیق كوڕی حومەیدی ئەبو موجەلەزی سەدوسی.

## روداوەکانی ساڵی هەشتا و حەوتی کۆچی ( ٧٠٦ زایینی )

## فەرمانداری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەمەدینە

لەم ساڵەدا وەلید، هشام کوڕی ئیسماعیلی لەحەوتی رەبیع الاوەل/ ٢٦ فەوریەی ٧٠٦ زایینی لەسەر کار لابرد. فەرمانڕەوایی ئەو لەم شارەدا چوارساڵ یەك مانگ کەمتر درێژەی کێشا. لەجیاتی ئەو عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان کرد. ئەو لەمانگی رەبیع الاوەل وەك فەرماندار ڕۆشتە ئەو شارە. باروبنەکەی عومەریان بەسی وشتر برد. ئەو لەماڵی مەروان دابەزی. خەڵك لەدەوری کۆبونەوە و سڵاویان بۆ نارد. کاتێك لەنوێژی نیمەڕۆ تەواو بو، دەکەس لەشارەزاییانی دینی مەدینەی بانگ کرد: عروە کوڕی زوبەیر، ئەبوبەکر کوڕی سلێمان کوڕی ئەبی خەیسەمە، عوبەیدالله کوڕی عەبدالله کوڕی عوتبە کوڕی مەسعود، ئەبوبەکر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حارس، سلێمان کوڕی یەسار، قاسم کوڕی محەممەد، سالم کوڕی عەبدالله کوڕی عەمرۆ، عەبدالله کوڕی عوبەیدالله کوڕی عومەر، عەبدالله کوڕی عامر کوڕی رەبیعە و خارجە کوڕی زەید. ڕۆشتنە لای و بەوانی وت: ئێوەم بۆ کارێك کۆکردۆتەوە کە لەبەرابەردا پاداشتی خواییتان پێدەبرێت و دەبنە یارانی راستی و دروستی: دەمەوێت هیچ کارێك بەبێ راوێژ کردن بەیەکێك لەئێوە کە لە شاردا بێت، ئەنجام نەدەم. ئەگەر بینیتان یەکێك لەکارگوزارەکانی من ستەمکاری دەکات یا دینارێك بەزۆر لەکەسێك وەردەگرێت، خوا دەکەمە پارێزەی ئەو کەسەی لەکاروبارەکانی ئەو کارگوزارەم ئاگادارم بکاتەوە. ئەوان هاتنەدەر و زمانیان بۆ وەسف کردنی ئەو کردەوە و بڵاوەیان لێکرد.

وەلید نامەی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوسی تا هشام کوڕی ئیسماعیل بەریسوایی لەبەرابەر خەڵکدا بوەستێنێت (تا لای ئەو تێپەڕن و جوێنبارانی بکەن). وەلید دڵی لەو پیس کردبو. هشام کوڕی ئیسماعیل بەردەوام لەگەڵ عەلی کوڕی حسین

بەشێوەیەکی خراپ هەڵس و کەوتی دەکرد و هشام ترسا کە عەلی کوڕی حسین و کەسەکانی بێن و دادی دڵی خۆیان وەربگرن. لەم کاتەدا عەلی کوڕی حسین ڕۆشتە لای کەسە نزیکەکانی خۆی و فەرمانی پێدان بەهیچ شێوەیەك زمان بۆ سەرکۆنە کردنی هشام نەکەنەوە. عەلی کوڕی حسین لای ئەو تێپەڕی کە لەبەرابەر خەڵك وەستابو و جوێنی دەبیست. عەلی زیانی پێنەگەیاند و هشام بانگی کرد: خوا باشتر دەزانێت پێغەمبەری خۆی لەناو کێدا هەڵدەبژێرێت (ئەنعام/٦/١٢٤).

## ئاشتی نەیزەك و قوتەیبە

کاتێك قوتەیبە لەگەڵ پاشای شومان پەیمانی ئاشتی بەست، نامەی بۆ نەیزەك پاشای بادغیس نوسی و داوای لێکرد دیلە موسوڵمانەکان ئازاد بکات. نامەی نوسی و ئەوی ترساند: نەیزەك ترسا و ئەسیرەکانی ئازاد کرد. قوتەیبە بەسولەیم ناصح کۆیلەی عوبەیدالله کوڕی ئەبی بەکرە نامەیەکی بۆ رەوانە کرد وپێشنیاری ئاشتی پێکرد و مژدەی پێدا کە ئەمانی پێدەبەخشێت. نامەی بۆ نوسی و سوێندی خوارد ئەگەر نەگاتە لای ئەو، هێرش دەکاتە سەری و لەهەر شوێنێك بێت دەیدۆزێتەوە و بۆ ئەم کارە ئەوەندە هەوڵ دەدات تا سەرکەوتن بەدەست دێنێت یا لەم ڕێگایەدا دەمرێت.

سولەیم بەنامەکەوە گەیشتە لای نەیزەك. نەیزەك راوێژی لەگەڵ کرد و وتی: ئەی سولەیم، چاکە لای خاوەنەکەی تۆ نیە، نامەیەکی بۆ من نوسیوە کە بۆ کەسێکی وەك منی نانوسن. سولەیم پێی وت: ئەو پیاوێکی سەختگیر لەپاشایەتیەکەی خۆیەتی، مێهرەبانە ئەگەر بەنەرمی هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەن و دڵرەقە ئەگەر روبەروی ببنەوە. کەواتە نابێت توندی نامەکەی تۆ بڕەنجێنێت. بەمیهرەبانی و چاکە هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکە. نەیزەك لەگەڵ سولەیم هەستا و خەڵکی بادغیس پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست لەسەر ئەو بنەمای کە قوتەیبە نەڕواتە ئەو سەرزەمینە.

## شەڕ لەگەڵ رۆم

دەڵێن: لەم ساڵەدا مەسلمە کوڕی عەبدولەلیك بۆ شەڕی رۆمیەکان بەرێکەوت و ژمارەیەکی فراوانی لەوان لەسوسەنە لەپانتاییەکانی مەصیصە کوشتار کرد و دەستی بەسەر قەلاکاندا گرت. دەستەیەك دەڵێن: ئەو کەسەی لەم ساڵەدا شەڕی کرد، هوشام

کوڕی عەبدولمەلیك بو کەفەلاگانی بولەق، ئەخرەم، پولیس و قومقومی گرت و نزیکەی هەزار شەڕکەر لەشەڕکەرە عەرەب ئاساکانی کوشت و ژن و منالەکانی ئەوانی بەئەسیری گرت.

## شەڕی قوتەیبە لەبیکەند

کاتێك قوتەیبە لەگەڵ نەیزەك ئاشتی کرد، تا کاتی نزیك بونەوەی وادەی جەنگ لەوێ مایەوە و لەساڵی ٨٧/ ٧٠٦ زایینی بۆ شەڕی بیکەند (نزیکترین شارەکانی بوخارا لەروبار) بەرێکەوت. کاتێك لای ئەوان دابەزی، داوایان لەخەڵکانی دەوروبەر و لەناو ئەوان خەڵکانی سەغد کرد تا هاوکاریان بکەن. ئەوان لەگەڵ سوپایەکی فراوان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان و ڕێگەیان لەقوتەیبە گرت. قوتەیبە نەیتوانی هیچ نێردراوێك رەوانە بکات وبۆ ماوەی دومانگ هیچ هەواڵێکی نەگەیشت. کاتێك حەجاج بینی هەواڵەکانی ئەو ناگات، دڵی بۆ سوپاییەکان سوتا و فەرمانی بەخەڵکدا لەمزگەوتەکان بۆ ئەوان بپارێنەوە. ئەوان هەمو رۆژێك شەڕیان دەکرد.

قوتەیبە سیخورێکی لەناو عەجەمەکان هەبو کە پێیان دەوت توندەر. خەڵکی بوخارا برێك سامانیان پێدا تا قوتەیبە لەشارەکەی ئەوان دوربخاتەوە. ئەو رۆشتە لای قوتەیبە و بەشێوەیەکی نهێنی پێی وت: حەجاج لەسەر کار لابراوە و فەرمانداریکی تازە بۆ خوراسان هاتوە، باشترە لەگەڵ خەڵك بگەرێیتەوە. قوتەیبە فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد لەبەر ئەوەی ئەو هەواڵە بلاو نەبێتەوە و خەڵك لەناو نەچن. دواتر فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا بوێرانە شەڕ بکەن. ئەو ئازایانەتر لەجاران شەڕی لەگەڵ ئەوان ئەزمون کرد. ناباوەڕان شکستیان خوارد و بۆ شارەکان هەلاتن و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و تا توانیان ئەوانیان کوشتار کرد و ئەسیریان کردن. ئەوانەی لەشارەکەدا بون، لەناو قەلاکان سەنگەریان گرت و قوتەیبە فەرمانی بەکرێکارەکاندا بورج و دیواری قەلاکە خاپور بکەن. خەڵکان خوازیاری ئاشتی بون و ئەو پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان بەست و کارگوزارێکی بۆ ئەوان دیاری کرد و مەبەستی گەڕانەوەی کرد. کاتێك پێنج فەرسەخ رێگەی بڕی، پەیمانی ئاشتی خۆیان شکاند و کارگوزار و هاورێیانی ئەویان کوشت. قوتەیبە هێرشی کردە سەر ئەوان و دیوارەکەی روخاند و ئەوان بۆ جاری دوەم خوازیاری ئاشتی بون کە رازی نەبو و بەزۆری شمشێر رۆشتە ناو شارەکەی ئەوان و پیاوە

شەڕکەرەکانی کوشتار کرد.

لەناو ئەو کەسانەی لەشارەکەدا گرفتار بون، پیاوێکی یەك چاو بو کە تورکەکانی دژی موسوڵمانان هاندەدا. بەقوتەیبەی وت: بەهای ئازادی خۆم لەبری دانی پێنج هەزار پارچەی پەرنیان دەبەخشم کە بایەکەی هەزار هەزار (درەم یا دینارە). قوتەیبە راوێژی لەگەڵ خەڵك کرد. وتیان: ئەمە زیادەیەکە لەتاڵانیەکان، زیانی ئەم پیرە پیاوە دەتوانێت چی بێت! وتی: نە سوێند بەخوا لەمەدوا هیچ موسوڵمانێك ترسی تۆی ناکەوێتە دڵ. فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد.

تالآنیەکانیان لەگەل و پەلی شەڕ و دەفرە زێرین و زیوینەکان و کەرەستەکانی تر بەدەست هێنا کە هیچ کەس ژمارە و ئەندازەکەی نەدەزانی. لەسەراسەری خوراسان هاوشێوەی ئەو تالآنیەیان دەست نەکەوتبو. موسوڵمانان بەم شێوەیە بەهێز بون. دابەش کردنی سامانە تالآن کراوەکان بە عەبداللە کوڕی والانی عەدەوی (پیاوێك لەبەنی مێلکان) سپێردرا. قوتەیبە ئەوی بەراستکار راستکار زادە ناو دەبرد کە راست کردار بو.

یەکێك لەگێڕانەوەکان سەبارەت بەراست کرداری باوکی ئەوە بو کە جارێك موسلیمی باهلی باوکی قوتەیبە بە والانی وت: من بڕێك سامانم هەیە و دەمەوێت بەتۆی بسپێرم بەشێوەیەك کەس نەزانێت. والان وتی: سامانەکەت بەپیاوێکی بڕواپێکراوی خۆت بۆ فلآن شوێن و فیسارە شوێن بنێرە و فەرمانی پێبدە کاتێك لەوێ پیاوێك دەبینێت، سامانەکە دابنێت و بگەڕێتەوە. موسلیم سامانەکەی کردە ناو هەمیانەیەك و باری ئێسترێکی کرد و بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی وت: ئەم سامانە بۆ فلآن شوێن و فیسارە شوێن ببە و کاتێك لەوێ پیاوێکت بینی کە دانیشتوە، ئێسترەکە بەرەڵا بکە و بگەڕێرەوە. کۆیلە ئەو کارەی کرد و بەرێکەوت. والان پێشتر ڕۆشتبوە ئەوێ و چاوەڕوانی هاتنی نێردراوەکەی دەکرد. نێردراوەکەی موسلیم دواکەوت و لەبەر ئەمە والآن گەڕایەوە جونکە گومانی دەکرد موسلیم پەشمیان بۆتەوە. پیاوێك لەبەنی تەغلەب هات و لەوێ دانیشت و کۆیلەی موسلیم هات و ئەوی بینی و سلآوی لێکرد و ئێسترەکەی تەسلیم کرد و گەڕایەوە. پیاوی تەغلەبی ئێستر و سامانەکەی هەڵگرت وبۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە. موسلیم گومانی کرد والان سامانەکەی هەڵگرتوە و لەبەر ئەمە پرسیاری لێنەکرد تا ئەوەی پێویستی بو. ڕۆشتە سەردانی و وتی: سامانەکەم بۆ بگێڕەوە. وتی: هیچم

وەرنەگرتوە و تۆ لای من سامانت نیە. موسلیم بەردەوام لای خەڵك سكاڵای لێدەكرد. رۆژێك سكاڵای دەست پێكرد و پیاوی تەغلەبی دانیشتبو. تەغلەبی بەتەنیا لەگەڵی دانیشت و سەبارەت بەسامانەكەی پرسیاری لێكرد و موسلیم ئاگاداری كردەوە. پیاوی تەغلەبی ئەوی بردە ماڵەكەی خۆی و سامانەكەی بۆ گەڕاندەوە و ئەوی لەچۆنیەتی رووداوەكە ئاگادار كردەوە. دوای ئەوە موسلیم بەردەوام دەڕۆشتە لای هۆز و خەڵكان و داوای لێخۆشبونی والانی دەكرد و لەچۆنیەتی رووداوەكە ئاگاداری دەكردنەوە (ئەگەر ئەفسانەكە راست بێت بەڵگەیە بۆ راست كرداری پیاوی تەغلەبی نەك والان).

دەڵێت: لەم ساڵەدا قوتەیبە دەستی بەسەر بیكەنددا گرت و بۆ مەڕو گەڕایەوە.

## بیركردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عومەر كوڕی عەبدولعەزیز فەرمانداری مەدینە لەگەڵ خەڵك حەجی كرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی مەدینە لەئەستۆی ئەبوبەكر كوڕی عەمرۆ كوڕی حەزمدا بو.

فەرمانداری خوراسان و عێراق لەدەستی حەجاجدا بو و جێگری ئەو لەبەسرە لەم ساڵەدا جەڕاح كوڕی عەبداللە حەكەمی بو و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە عەبداللە كوڕی ئۆزەینە. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی كوفە ئەبوبەكر كوڕی ئەبو موسا ئەشعەری بو.

ئەم كەسانە لەم ساڵەدا مردن: عوبەیداللە كوڕی عەباس لەمەدینە یا یەمەن كە یەك ساڵ لەعەبداللە كوڕی عەباس بچوكتر بو، موتەریف كوڕی عەبداللە كوڕی شێخەیر لەتاعونە گشتیەكەی خەڵكانی بەسرە، مێقدام كوڕی مەعدی كەربی كێندی كە چاوی بە پێغەمبەر(د.خ) كەوتبو و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٩١/٧١٠ زایینی كۆچی دوایی كرد و ئومەییە كوڕی عەبداللە كوڕی ئوسید.

## روداوەکانی ساڵی هەشتا و هەشتی کۆچی ( ٧٠٧زایینی )

## دەست بەسەردا گرتنی تەوانە لە پانتاییەکانی رۆم

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك و عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك بۆ شەڕ لەشارەکانی رۆم بەڕێکەوتن. وەلید پێشتر نامەی بۆ خاوەنی ئەرمەنستان نوسیبو و فەرمانی پێدابو تا بۆ پاشای رۆم نامە بنوسێت و ئاگاداری بکاتەوە کە خەزەرییەکان و پاشاکانی دیکەی کوێستانەکانی ئەرمەنستان کۆبونەوە و مەبەستی ولاتەکەی ئەویان هەیە. وەلید فەرمانی ئامادەبونی بەخەڵکانی شامدا تا بۆ شەڕی ئەرمەنستان بەڕێکەون. سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و هەمو کەرەستەکانی شەڕی بەشێوەیەکی فراوان هەڵگرت و بەرەو جەزیرە بەڕێکەوت و دواتر رێگەی خۆی بۆ رۆم گۆڕی. ئەوان لەگەڵ رۆمیەکان شەڕیان کرد و شکستیان پێ هێنان و دواتر رۆمیەکان هێرشیان کرد و موسوڵمانەکان شکستیان خوارد و هەڵاتن. عەباس لەگەڵ چەند کەسێك خۆڕاگری کرد کەیەکێك لەوان ئەبو موحەیریزی جومەحی بو. عەباس پێی وت: خوێنەرانی قورئان کەئارەزوی بەهەشتیان دەکرد، لەکوێن؟ کوڕی موحەیریز وتی: بانگیان بکە تا لەدەوری تۆ کۆببنەوە. عەباس هاواری کرد: ئەی خوێنەرانی قورئان! هەمویان لەدەوری کۆبونەوە و شەڕیان کرد تا رۆمیەکان شکستیان خوارد و ئەوان رۆشتنە ناو تەوانە و موسوڵمانان گەمارۆیان خستنەسەر و لەجەمادی الاوەل/ ئاوریلی ٧٠٧ زایینی دەستیان بەسەرداگرت.

دەڵێن: لەم ساڵەدا وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك لەدایك بو.

## نۆژەن کردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەر( د.خ )

دەڵێن: لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاوەل، فەوریەی ٧٠٧ زایینی وەلید نامەی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوسی و فەرمانی پێدا ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر پەیوەستی مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) بکات و دەوروبەری مزگەوتەکە تا دوسەد گەز لەدوسەد گەز بکرێت. پێی وت: ئەگەر توانیت، قیبلە بێنیتە پێش، تۆ پێگەی خاڵەکانی

خۆت باش دەزانیت و دەزانیت لەگەڵ تۆدا ناسازگاری ناکەن، هەرکام لەوان رازی نەبو، زەوی و ماڵەکەی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بخەملێنن و ماڵەکانیان بەسەردا خاپور بکەن و بەهاکەیان پێ بدەن چونکە نمونەیەکی باشتان لەعومەر و عوسمان بۆ بەجێ ماوە.

عومەر ئەوانی بانگ کرد ونامەکەی وەلیدی بۆ خوێندنەوە. ئەوان بەبەهاکە رازی بون کە پێیان درا و کرێکارەکان دەستیان بەوێران کردنی ماڵی هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ)کرد و ئەو سەرقاڵی نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) بو و بۆ ئەو مەبەستە کرێکاری لەشامەوە هێنا. وەلید کرێکارەکانی رەوانە کردبو. نامەی بۆ پاشای رۆم نوسی و ئاگاداری کردەوە کە مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ)وێران کردوە تا دوبارە نۆژەنی بکاتەوە. پاشای رۆم هەزار مسقاڵ زێر و سەد کرێکار و چل وشتر کاشی بۆ رەوانە کرد کە وەلیدیش رەوانەی مەدینەی کرد. عومەر و خەڵکان کۆبونەوە و بناغەی پایەکانیان دانا و نۆژەن کردنەوەیان دەست پێکرد.

دەڵێن: لەم ساڵەدا مەسلیمە کوڕی عەبدولمەلیك جارێکیتر شەڕی لەگەڵ رۆمیەکان کرد و دەستی بەسەر سێ قەلایی (کۆنستانتین و ئەخرەم و غەزالەدا) گرت و نزیکەی هەزار کەس لەعەرەب ئاساکانی کوشت و سامانەکانی تالان کرد.

## شەڕ نومشك و رامیسە

دەڵێن: لەم ساڵەدا قوتەیبە کوڕی موسلیم بۆ شەڕ لەنومشك بەرێکەوت و براکەی خۆی یەسار کوڕی موسلمی وەك فەرمانداری مەرو دەستنیشان کرد. خەڵك پێشوازیان لێکرد و ئەو پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و دواتر بەرەو رامیسە بەرێکەوت کە خەڵکەکەی بەئاشتی پێشوازیان لێکرد و قوتەیبە بۆ مەرو گەڕایەوە.

دواتر تورکەکان هاورێ لەگەڵ سەغدیەکان و خەڵکی فەرغانە بەسوپایەکی دوسەد هەزار کەسی هاورێ لەگەڵ پاشاکەیان کورینعابون خوشکەزای پاشای چین هێرشیان کردەسەر. ئەوان روبەروی موسوڵمانەکان بوونەوە و لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی موسلیم برای قوتەیبە شەڕیان کرد. ئەو فەرمانەدەی کۆتایی سوپاکەبو و لەنێوان ئەو تا پێشەنگەکانی سوپاکەی قوتەیبە یەك میل دوری بو. تورکان ئەویان بینی و شەڕیان لەگەڵ کرد. قوتەیبە گەڕایەوە و عەبدولرەحمان بینی کە شەڕ لەگەڵ تورکەکان دەکات و

ئەوەندەی نەماوە تورکەکان بەسەر موسوڵمانەکاندا سەرکەون. کاتێك موسوڵمانەکان قوتەیبەیان بینی، گیانیان ئارام و چاویان روناك بویەوە وتا کاتی نیمەڕۆ شەڕیان کرد. لەم شەڕەدا نەیزەك پیاوانە شەڕی کرد کە هاورێی قوتەیبە بو. تورکەکان شکستیان خوارد و قوتەیبە گەڕایەوە و لەشوێنی تەرموز روباری بڕی و گەڕایەوە بۆ ناو مەرو.

## کارە چاکەکانی وەلید

لەم ساڵەدا وەلید نامەی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوسی و فەرمانی پێدا رێگاکان و گەردەنەکان ئەمن و ئارام بکات و چاڵاوەکان هەڵکەنێت و بناغەی سەدێکی گەورە دابرێژێت. عومەر ئەو کارەی کرد و ئاوەکەی بەردایەوە. کاتێك وەلید حەجی کرد و ئەوەی بینی، پەسەندی کرد و چەندین کەسی راسپارد تا پاسەوانی لێبکەن. بەخەڵکان و سەردانکەرانی مزگەوتی وت لەو ئاوە بخۆنەوە. نامەی بۆ هەمو شارەکان نوسی رێگاکان ئەمن و ئارام و چاڵاوەکان هەڵکەنن. رێگەی لەچەتە و رێگرەکان کرد و رۆژی و بژێوی بۆ دیاری کردن.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەگەڵ خەڵك حەجی کرد و دڵنەوایی دەستەیەك لەقورەیشیەکانی دایەوە و مەڕومالاتی لەگەڵ خۆی بۆ مەککە برد و لەشوێنی زونەلحەلیفە ئیحرامی بەست و کاتێك گەیشتە تەنعیم، بیستی کە ئاو لەمەککە کەمە و مەترسی تینویەتی هەڕەشە لەحاجیەکان دەکات. عومەر وتی: دەبێت لەخوا بپاڕێینەوە. هەموان پاڕانەوە و بەرێکەوتن و هاورێ لەگەڵ باران و لافاوی دۆڵەکان گەیشتنە ماڵی خوا. خەڵکانی مەککە لەزۆری ئاوەکە ترسان و باران عەرەفەی گرتەوەو سەرسەوزی و شادابی لەمەککە فراوان بو.

دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا عومەر کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك ئاینی حەجی ئەنجامدا.

فەرماندارەکان ئەو کەسانە بون کە ساڵی پێشتر فەرمانڕەوایەتیان دەکرد.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: سەهل کوڕی سەعدی ساعدی کە دەستەیەك دەڵێن لەساڵی ٩١/ ٧١٠ زایینی مردوە و تەمەنی ئەو بەسەد ساڵ دەزانن. عەبداللە کوڕی بوسری

مازنی لەمازن کوڕی مەنسور لەو کەسانەی کە لەهەردو قیبلە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)نوێژی خوێند. ئەو دوایین کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بو کە لەشام کۆچی دوایی کرد.

## رووداوەکانی ساڵی هەشتا و نۆی کۆچی ( ٧٠٨ زایینی )

### شەڕ لەگەڵ رۆمیەکان

دەڵێن: لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك و عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك شەڕیان لەگەڵ رۆمیەکان کرد و مەسلەمە دەستی بەسەر قەلاّیی عەمووریەدا گرت و عەباس قەلاّیی ئازەرولیە. ئەو شەڕی لەگەڵ دەستەیەك لەرۆمیەکان کرد و ئەوانی تێکشکاند.

دەستەیەك دەڵێن: مەسلەمە مەبەستی عەمووریەی کرد و لەوێ رووبەرووی دەستەیەکی فراوان لەرۆمیەکان بویەوە و شکستی پێهێنان و دەستی بەسەر هێرقەلە و قەمونیەدا گرت و عەباس لەهاوین لەپانتاییەکانی بەزنەدون شەڕی ئەزمون کرد.

### شەڕی قوتەیبە لەبوخارا

لەم ساڵەدا نامەی حەجاج بەدەستی قوتەیبە گەیشت کە فەرمانی پێدەدا مەبەستی وەردان خوداه بکات. ئەو لەلای (زەم) لەرووباری پەڕیەوە و لەسەر رێگەی بیابان رووبەرووی خەڵکانی سەغد و کێش و نەسەف بویەوە. ئەوان هاورێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە شەڕیان لەگەڵ کرد و قوتەیبە بۆ ماوەی دو شەو ورۆژ شەڕی لەگەڵ ئەوان ئەزمون کرد و دواتر مەبەستی شەڕی لەگەڵ وەردان خوداه پاشای بوخارا کرد بەلاّم نەیتوانی کارێکی ئەوتۆ ئەنجام بدات و بۆ مەرو گەڕایەوە و هەواڵەکانی بۆ حەجاج نوسی. حەجاج نامەی بۆ نوسی تا چۆنیەتی هێرش کردنەکەی بۆ بنوسێت. قوتەیبە ئەو کارەی کرد. حەجاج بۆی نوسی تا لەگوناحەکەی خۆی تۆبە بکات و لەفلاّنە شوێن و فیسارە شوێنەوە هێرش ببات. نوسی: خەڵکانی کێش کوشتار بکە و نەسەف خاپوور و لەوەردان مەگەرێرەوە و خەڵکان پەرێشان بکە. لەسەر گەردەنەکان پاسەوانەکان جێگیر و گفتوگۆ لەگەڵ من مەکە.

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی بوخارا لەساڵی ٩٠/ ٧٠٩ زایینی رویداکە بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

## فەرمانداری خالید کوڕی عەبدالله قەسری لەمەککە

دەڵێن: لەم ساڵەدا خالید کوڕی عەبدالله قەسری وەك فەرمانداری مەککە دەستنیشان کرا. وتارێکی پێشکەشی خەڵك کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، کێ بەرێزترە؟ جێگری پیاو لەسەر کەسان و بنەماڵەکەی یا نێردراوی ئەو بۆ لای ئەوان؟ سوێند بەخوا ئێوە هەست بە لەپێشی و گەورەیی خەلیفە ناکەن مەگەر ئەوەی من بڵێم: ئیبراهیم (هاورێی خوا) داوای ئاوی لێکرد و خوا ئاوێکی تاڵ و سوێری دەرخواردا و خەلیفە داوای ئاوی لێکرد کە خوا شیرینترین ئاوی پێ بەخشی. مەبەستی لەئاوی سوێر و تاڵ زەمزەم و لەئاوی شیرین ئەو چاڵە بو کە وەلید لەگەردەنەی تەویی لەگەردەنەی حەجون هەڵیکەندبو. ئاوەکەی شیرین بو و ئاوەکەیان دەهێنا و دەیانرشتە ئەستێلکێك لای زەمزەم تا گەورەیی وپیرۆزی زەمزەم ئاشکرا ببێت. ئەو چاڵە وشکی کرد و پڕبویەوە و ئاوی تیا نەما بەشێوەیەك ئەمڕۆکە کەس نازانێت لەکوێدا بوە.

دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٩١/ ٧١٠ زایینی یا ٩٤/ ٧١٤ خالید کوڕی عەبدالله قەسری بو بەفەرمانداری مەککە کە ئاماژەی پێدەدەین.

## کوژرانی زاهر پاشای سند

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی قاسم کوڕی محەممەد کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی عەقیلی سەقەفی کە هاوتای حەجاج بو لەداوەری، زاهر کوڕی صەعصەعە پاشای سندی کوشت و دەستی بەسەر وڵاتەکەیدا گرت. حەجاج کوڕی یوسف، ئەوی کردبوە فەرمانداری ئەو سنورە و شەش هەزار شەڕکەری لەگەڵ ڕەوانە کردبو وهەمو پێویستیەکان لەسامان و دەرزی و دەزوی خستبوە بەردەست. محەممەد بەرەو مەکران بەرێکەوت و چەند رۆژێك لەوێ مایەوە و دواتر رویکردە قەنزەبور و دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرت و دواتر ڕۆشتە ئارماییل و دەستی بەسەردا گرت و لەوێوە بەرەو دەیبوجل بەرێکەوت و رۆژی هەینی لەوێ دابەزی. ئەو کەشتیانەی شەڕکەران و کەرەستەکانی شەڕی هەڵگرتبو، گەیشتن. کاتێك لەدەبیل دابەزی، سەنگەری هەڵکەند و خەڵکانی لەشوێنەکانی خۆیان جێگیر کرد و بەردهاوێژێکی دانا کە پێیان دەوت (عروس) (بووك) کەجێگەی پێنسەد پیاوی شەڕکەری پڕدەکردەوە. لەدەبیل بتێکی گەورەیی لێبو کە دەکەڵێکی گەورە لەسەر

سەری جێگیر کرابو و ئاڵایەکی سور کە کاتێك با هەڵیدەکرد، لەشارەکەدا دەشەکایەوە و دەسوڕایەوە و پێیان دەوت (بۆد). بۆد بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوە. بۆد بتێکی گەورە لەژێر بینایەکی گەورە لەژێر چەپکە گوڵێکی هەڵواسراو بو و ئەم دەکەڵە لەسەر ئەو چەپکە گوڵە. هەرچیان دەپەرەستی بە (بۆد) ناویان دەبرد.

محەممەد بۆ ماوەیەکی زۆر گەمارۆی خستە سەر ئەو سەرزەمینە و بە بەردهاوێژەکە بەردێکی بۆ بووکی دەکەڵەکە هاویشت کە تێکیشکاند وناباوەڕان ئەمەیان بەخراپە لێکدایەوە. دواتر ئەوان لەشارەکە هاتنەدەر و محەممەد روبەرویان بویەوە و شەڕی کرد و تێکیشکاندن وبۆ ناوشارەکە پاشەکشێی پێکردن. فەرمانیدا پەیژەکانیان هێنا و پیاوە شەڕکەرەکان بەسەریدا هەڵگەران. یەکەم کەس کە ڕۆشتەسەر، پیاوێك لەخەڵکانی کوفە بەناوی مەردا بو. شار بەزۆری شمشێر دەستی بەسەرداگیرا و محەممەد بۆ ماوەی سێ رۆژ لەو شارەدا کوشتاری کرد و کارگوزارەکەی زاهر هەڵات. محەممەد چوار هەزار کەس لەموسوڵمانەکانی لەو شارەدا نیشتەجێ کرد بناغەی مزگەوتێکی داڕشت و لەوێوە بەرەو بیرون بەرێکەوت. خەڵکەکەی نامەیان بۆ حەجاج نوسیبو و پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ مۆر کردبو. ئەوان پێشوازیان لەمحەممەد کرد و خواردنیان بۆ هێنا و موسوڵمانانیان بردە ناوشارەکەی خۆیان. محەممەد لەوێ بەرێکەوت و لەهەر شارێك تێپەڕی دەکرد، دەستی بەسەردا دەگرت تا ئەوەی گەیشتە روبارێك لەخوارەوەی مێهران. خەڵکی سەربیدس ڕۆشتنە لای و پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ مۆر کرد. محەممەد باجی لەسەر دانان و لەشارەکەی ئەوان ڕۆشت و رویکردە سەهبان و دەستی بەسەردا گرت و دواتر بەرەو روباری مێهران رەوانە بو و لەوێ دابەزی.

زاهر لەکارەکانی ئەو ئاگادار بویەوە و بۆ شەڕخۆی ئامادە کرد و سوپایەکی بۆ سەدوستان نارد. خەڵکەکەی خوازیاری ئەمان و ئاشتی بون کەئەمانی پێبەخشین و باجی لەسەر دانان. دواتر محەممەد لەنزیك سەرزەمینەکانی راسێل پاشا لەسەر ئەو پردەی هەڵیبەستبو، لەروباری مێهران پەڕیەوە. زاهر گرنگی بەکارەکانی ئەو نەدەدا. محەممەد و موسوڵمانان روبەروی بونەوە. زاهر سوار لەسەر فیل و فیلەکان لەدەوری ئەو و (تکاکرە) هاورێیەتی ئەویان دەکرد. شەرێکی قورسیان دەست پێکرد کە هاوشێوەکەی نەبیستراوە. زاهر دابەزی و لەکاتی ئێوارێ کوژرا. ناباوەڕان شکستیان خوارد و

موسوڵمانان تا توانیان ئەوانیان کوشتار کرد. بکوژەکەی زاهر وتی:

الخيل تشهد يوم ذاهر و القنا و محمد بن القاسم بن محمد

انى فرجت الجمع غير معرد حتى علوت عظيمهمبمهند

فتركته تحت العجاج مجندلا متعفر الخدين غير موسد

یانی: ڕمەکان شایەتن و ئەسپەکان و محەممەد کوڕی قاسم کوڕی محەممەد، کە من ئەو سوپایەم تێکشکاند و شمشێرێکی هیندیم لەناوچاوی سەروەری ئەواندا. ئەوم لەناو تەپ و تۆزی گۆڕەپان لەناو خاك و خوێنی خۆیدا بەجێهێشت بەشێوەیەك هەردو کوڵمی لەزەوی دەدرا و سەرێنێك نەبو سەربکاتە سەری.

کاتێك زاهر کوژرا، محەممەد دەستی بەسەر سەرزەمینەکانی سنددا گرت و شاری راوەری بەزۆری شمشێر کردەوە. ژنەکەی زاهر لەم شارەدا بو کە لەترسی گرفتار بون خۆی و هەمو کەنیزەکان و سامانەکەی ئاگر تێبەردا.

محەممەد بەرەو برەهمەن ئاوای کۆنە لەدو فەرسەخی مەنصورە بەرێکەوت. هێشتا مەنصور مێرگەلان و ئاباوەڕان لەوێ مۆڵیان خواردبو. ئەوان لەگەڵ محەممەد شەڕیان کرد و محەممەد بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و ژمارەیەکی فراوانی کوشتار کرد و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت.

لەوێ هاتەدەر و مەبەستی (رورو بەغروری) کرد و خەڵکانی ساوەندی چاویان پێیکەوت کە داوای ئەمانیان کرد و محەممەد بەوانی بەخشی و پەیمانی لێوەرگرتن تا میوانداری موسوڵمانەکان بکەن. چەندین ساڵ دواتر خەڵکی ئەو سەرزەمینە باوەڕیان بەئیسلام هێنا. دواتر بەرەو بەسمەد پێشڕەوی کرد و لەگەڵ خەڵکەکەی پەیمانی ئاشتی بەست و گەیشتە رور (لەشارەکانی سند لەداوێنی کوێستان) وبۆ ماوەی چەند مانگێك گەمارۆی خستەسەر کەسەرئەنجام پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست و محەممەد لەوێوە بەرەو سکەکە بەرێکەوت و دەستی بەسەردا گرت و لەروباری بەیاس تێپەڕی و خۆی گەیاندە موڵتان کە خەڵکەکەی شەڕیان لەگەڵ کرد و شکستیان خوارد. بۆ ناوشارەکە پاشەکشێیان کرد و محەممەد گەمارۆی خستە سەریان. پیاوێك هات و ڕێگەیەکی نیشاندا کە لەوێوە دەڕۆشتە ناو شارەکە. محەممەد ڕێگەی ئاوی لێگرتن. کاتێك تینویەتی زۆری بۆ هێنان، خۆیان تەسلیم کرد و لەسەر فەرمانی محەممەد هاتنەدەر. محەممەد

شەڕکەرانی کوشت و ژنان و مناڵەکان خزمەتکارەکانی بۆدی ئەسیر کرد کە شەش هەزار کەس بون. چەندین کۆپەڵەی گەورە زێڕیان دەست کەوت کە زێڕەکانیان لەسەربانێکی بەرزەوە رژاندە ناو ماڵێك بەدرێژایی دەگەز و پانی هەشت گەز. لەبەر ئەمە موڵتانیان بە (کەلێنی ماڵی زێڕ) ناوبرد. مەبەستیان لەکەلێن لێرەدا سنورە. بۆدی موڵتانی شکۆیەکی ئەوتۆی بو کە سامان و دیاریان لەهەمو ناوچەکانەوە بۆ دەهێنا و لەشارە جۆراوجۆرەکانەوە خەڵك بۆ سەردان کردنی دەهاتن و لەوێ سەرووریشی خۆیان دەتاشی. گومانیان دەکرد بتەکەی ئەوان ئەیوبی پێغەمبەرە.

پانتایی سنورەکانی ژێر دەستی محەممەد فراوان بو و حەجاج هەزینەی ئەو سنورەی خەملاند کە بەشەست هەزار هەزار (شەست ملیۆن) درەم بەراوەردی کرد. حەجاج ئەو سامانانەی بژارد کەبەدەستی خۆی گەیشتبو و بینی کەسەد هەزار هەزار و بیست هەزار هەزار (سەد و بیست ملیۆن ) درەمە. وتی: شەست هەزار هەزار درەم سوودمان برد و تۆڵەی خۆمان سەندەوە و سەری زاهرمان کەوتە ژێر پێ.

حەجاج مرد. بەخواستی خوا چارەنوسی محەممەد لەکاتی ئاماژەدان بەمەرگی حەجاج باس دەکەین.

## دانانی موسا کوڕی نەصیر لەئەفریقیە

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عەبدولمەلیك ، موسا کوڕی نەصیری وەك فەرمانداری ئەفریقیە دەستنیشان کرد. باوکی ئەو نەصیر فەرماندەی پاسەوانەکانی معاویە بو. کاتێك معاویە بۆ شەڕی صەفین بەرێکەوت، نەصیر هاورێیەتی نەکرد. معاویە وتی: بەخششەکانی من بۆ تۆ زانراوە، بۆ هاورێیەتیم ناکەیت؟ نەصیر وتی: بەسوپاس کردنی تۆ ناباوەڕی کەسێك ناکەم کە لەتۆ بۆ سوپاس کردن شیاوترە. مەبەست خوای گەورەیە. معاویە بێدەنگ بو.

موسا گەیشتە ئەفریقیە و بینی ساڵح لەوێیە کەئەویش لەلایەن حەسانەوە وەك جێگری خۆی لەم ناوچەیە دەستنیشان کراوە. بەربەرییەکان دوای ڕۆشتنی حەسان چاوی تەماحیان بڕیە ئەم ناوچەیە. کاتێك موسا گەیشت، ساڵحی لەسەر کار لابرد. بیستی کە لەسوچ و قوژبنەکانی ئەو سەرزەمینە خەڵکانێك ژیان بەسەر دەبەن کە یاخی گەریان کردۆتە پیشە. کوڕەکەی خۆی عەبداللەی بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد. عەبداللە شەڕی

لەگەڵ ئەوان کرد و شکستی پێهێنان و هەزار سەر ئەسیری گرت. باوکی لەرێگەی دەریاوە بۆ دورگەی مەیومرقەی نارد کە تالآنیکرد. سامانێکی ئەوەندەی لەوێ تالآن کرد کە نەژمێردرا. کوڕەکەی هارونی بۆ شەڕی خەلکانیتر رەوانە کرد کەبەسەر ئەواندا سەرکەوت و بەئەندازەی براکەی ئەسیری گرت. خۆی شەڕی لەگەڵ خەلکانێکیتر کرد و هەمان ئەندازە سامانی تالآن کرد. پێنج لەسەر یەکی ئەسیرەکانیان بەشەست هەزار کەس خەملآند ( و هەمو ئەسیرەکان ١٢٠٠٠٠٠ سەر). کەس ئاماژەی بەوە نەدا کە ئەم ژمارەیان بەئەسیری گرتبێت.

دوای ئەوە، لەئەفریقیە وشکەساڵی دەرکەوت و گرانی تەنگی بەخەلکان هەڵچنی. ئەو خەلکی کۆکردەوە و نوێژی بارانی لەگەڵ خوێندن و لەخوا پاڕایەوە. دواتر وتارێکی پێشکەش کردن کە ئاماژەی بەوەلید نەدا. لەهۆکاری ئەم کارەیان پرسی و وتی: ئێرە پێگەیەکە کە سلآو بۆ کەس نانێرن و تەنیا بیری خوای گەورە دەکەنەوە. باران بەسەر خەلکدا باری و بایی کالآ و کەل وپەلەکان هەرزان بویەوە. بۆ شەڕی تەنجە بەرێکەوت و مەبەستی لەناو بردنی پاشماوەی بەربەرەکانی کرد. ئەوان لەترسا رایانکردبو. شوێنیان کەوت و کوشتارێکی مەترسیداری لەناو خەلکاندا خستەگەڕ تا گەشتە سوسی خوارو چیتر کەسی لەبەرابەر خۆیدا نەبینی. بەربەریەکان داوای ئەمانیان کرد و ملکەچی فەرمانەکانی بون. ئەو کۆیلەکەی خۆی تارق کوڕی زیادی کردە فەرمانداری ئەو ناوچەیە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو پیاوێکی (صەدەفی) بو. سوپایەکی گەورەی کردە هاورێی کە زۆربەیان لەبەربەریەکان بون. چەندین کەسی دیاری کرد تا قورئان و ئایینەکانی ئیسلامیان فێر بکەن. دواتر بۆ ئەفریقیە گەڕایەوە. لای قەلآی مەجانە تێپەڕی کرد کە خەلکەکەی لەناو قەلآکەدا سەنگەریان گرت. کەسانێکی دیاری کرد کە گەمارۆیان خستە سەر ئەو قەلآیە. فەرماندەکەیان بوشر کوڕی بەهمان بو. بوشر دەستی بەسەر قەلآکەدا گرت و لەبەر ئەمە قەلآکەیان بە قەلآی بوشر ناوبرد و تا ئێستایش بەو ناو دەناسرێت. لەئەفریقیە کەس نەمایەوە لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکات.

دەستەیەك دەڵێن: فەرمانڕەوایی موسا لەساڵی ٦٩٧/٧٨ زایینی بو. عەبدولعەزیز کوڕی مەروان (کارگوزاری براکەی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان) ئەوی وەك فەرمانداری ئەفریقیە دەستنیشان کرد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەسنورەکانی ئازەربایەجانەوە هێرشی کردە سەرتورکەکان و دەستی بەسەر چەندین قەلاّ و شاردا گرت.

عومەر کوڕی عەبدولعەزیز حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. کارگوزارەکان کەسانی ساڵی پێشو بون.

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی سەعلەبە کوڕی صوغەیری عوزری هاوپەیمانی بەنی زوهرە کۆچی دوایی کرد. دەڵێن: لەدایك بونی ئەو چوار ساڵ پێش کۆچ/ دەوروبەری ساڵی ٦١٨ زایینی یا لەساڵی شەشی کۆچی/ ٦٢٧ زایینی بو. هەروەها زەلیم کۆیلەی عەبداللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لەئەفریقیە مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی نەوەدی کۆچی (٧٠٩ زایینی)

## گرتنی بوخارا

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کاتێك قوتەیبە لای وەردان خوداه پاشای بوخارا گەڕایەوە، نامەی حەجاجی بەدەست گەیشت کە فەرمانی پێدەدا بگەڕێتەوە. نیشانیدا لەکوێەوە دەبێت هێرش بکاتە سەر ئەو سەرزەمینە. کاتێك فەرمانەکەی حەجاجی بەدەست گەیشت، قوتەیبە لەساڵی ٧٠٩/٩٠ زایینی بۆ شەڕ ڕەوانە بو. وەردان خوداه خەڵکانی سەغد و تورکەکانی دەوروبەری خۆی هەڵخڕاند و ئەوانیش دەستی هاوکاریان بۆ درێژ کرد. قوتەیبە پێش دەستی کرد و گەمارۆی خستە سەرشارەکە. کاتێك هێزە پشتیوانەکان بۆ هاوکاری ئەوان هاتن، بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانەکان لەشار هاتنەدەر و شەڕیان دەست پێکرد. خەڵکانی ئەزد وتیان: ئێمە لەسوچێکدا جێگیر بکە تا کوشتاریان بکەین! قوتەیبە وتی: پێشڕەوی بکەن. ئەزدیەکان پێشڕەویان کرد و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. ئەزدیەکان شکستیان خوارد و بۆ ناو لەشکرگەکەی خۆیان پاشەکشێیان کرد و بتپەرستەکان شوێنیان کەوتن و ئەوانیان تێکشکاند و گەیشتنە لەشکرگەکەی ئەوان بەشێوەیەك ژنان شەقەزللەیان لەروخساریان دەدا و شین و ڕۆڕۆیان دەست پێکرد. دو باڵی سوپای موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر تورکەکان و بۆ شوێنەکانی خۆیان پاشەکشێیان پێکردن. تورکەکان لە (نەشەز) خۆڕاگریان کرد. قوتەیبە وتی: چ کەسێك دەتوانێت لەو شوێنە دەریانبەڕێنێت؟ کەس هەنگاوی نەبردە پێش. ڕۆشتە لای بەنی تەمیم و وتی: شەڕێکە هاوشێوەی شەڕەکانی ئێوە. وەکیع ئاڵاکەی هەڵگرت و وتی: ئەی بەنی تەمیم، ئایا بەتەنیا جێم دەهێڵن؟ وتیان: نا ئەی باوکی موتەریف.

هورەیم کوڕی ئەبی تەحمە فەرماندەی سوارەکانی ئەوان بو و فەرماندەی گشتی وەکیع. وەکیع ئاڵاکەی پێدا و وتی: ئەی هورەیم، پێشڕەوی بەسوارەکانت بکە. هوڕەیەم پێشڕەوی دەست پێکرد و وکیع هاورێ لەگەڵ پیادەکان بەدوای ئەودا. هوڕەیم گەشتە روبارێك لەنێوان خۆی و سوپای تورکەکان و وەستا. وەکیع وتی: ئەی هورەیم، پێشڕەوی بکە. هورەیم هاوشێوەی وشترێکی مەست سەیری کرد و وتی: ئەسپەکانم بخەمە ناو ئەم روبارە؟ ئەی ئەزان، ئەگەر بخلیسکێن، هەموویان لەناو دەچن. وەکیع وتی: ئەی زادەی ژنی

بۆگەن، نافەرمانی فەرمانەکەی من دەکەیت! دارێکی بەدەستەوە بو و بەو دارە لێیدا. هورمیم هاورێ لەگەڵ سوارەکان لەروبارەکە تێپەڕی. وەکیع گەیشتە روبارەکە و پردێکی هەڵبەست و بەهاوەڵانی خۆی وت: هەرکەس بۆ گیان بەخشین ئامادەیە، تێپەڕێت و گەرنە لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە. تەنیا هەشسەد پیاوی شەڕکەر پەڕینەوە. کاتێك ئەوانی پەڕاندەوە و لەدوژمن نزیك کەوتەوە، بەهورمیمی وت: من بەشمشێر ورم هێرش دەبەم و تۆ لەگەڵ سوارەکانت ئەوان بەخۆتەوە سەرقاڵ بکە. وەکیع هێرشی برد و شەڕی دەست پێکرد و هورمیم هاورێ لەگەڵ سوارەکانی. ئەوەندە شەڕیان کرد تا لەتەپۆڵکەکە پاشەکشێیان پێکردن و قوتەیبە هاواری کرد: نابینن دوژمن شکستی خواردوە؟ کەس نەپەڕیەوە تا دوژمنان بەتەواوی پاشەکشێیان کرد. خەڵك پەڕینەوە و قوتەیبە وتی: هەر کەس سەرێکی براو بێنێت، سەد درهەمی پێ دەبەخشم. سەری زۆریان کۆکردەوە. لەو رۆژەدا یانزە کەس لەبەنی قورەیع هاتن و هەرکام سەرێکیان پێبو. دەوترا، کێیت؟ دەیوت: لەخەڵکی قورەیعە. پیاوێکی ئەزدی سەرێکی هێنا. پێیان وت: کێیت؟ وتی: قورەیعیم؟ قوتەیبە وتی: بۆ درۆت کرد؟ وتی: بینیم هەر کەس کە سەر دێنێت، دەڵێت: قورەیعیم. گومانم کردە هەر کەس سەری پێ بێت دەبێت بڵێت: قورەیعیم. قوتەیبە پێکەنی.

خاقان و کوڕەکەی بریندار بون و خوا سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و حەجاجیان لەم سەرکەوتنە ئاگادار کردەوە.

## ئاشتی قوتەیبە لەگەڵ خەڵکانی سەغد

کاتێك قوتەیبە خەڵکی بوخارای سەرکوت کرد، خەڵکانی سەغد ترسیان لێ نیشت. تەرخون پاشاکەیان لەگەڵ دو سوارە گەیشتنە نزیك لەشکرگەکەی ئەو و داوای پیاوێکیان کرد تا قسەی لەگەڵ بکەن. قوتەیبە حەییانی نەبتی رەوانە کرد و تەرخون خوازیاری ئاشتی بو لەسەر بنەمای دانی باج. قوتەیبە بەداواکەی رازی بو و ئاشتی کرد. تەرخون بۆ وڵاتەکەی و قوتەیبە هاورێ لەگەڵ نەیزەك گەڕایەوە.

## پەیمان شکێنی نەیزەك و گرتنی تاڵەقان

دەڵێن: کاتێك نەیزەك هاورێ لەگەڵ قوتەیبە لەبوخارا گەڕایەوە، نەیزەك لەفراوان بونی سنوری فەرمانڕەوایی ئەو ترسی لێ نیشت و بەهاوەڵانی خۆی وت: من لەگەڵ ئەم پیاوەدام بەڵام لێی دڵنیا و ئاسودە نیم. باشترە فەرمانێکی لێوەربگرم و بگەڕێمەوە. وتیان: ئەو کارە بکە. قوتەیبە لەئامول بو کەنەیزەك داوای فەرمانی لێکرد. قوتەیبە فەرمانی پێدا و نەیزەك گەڕایەوە و مەبەستی تەخارستانی کرد تا گەیشتە نەوبەهار. ماوەیەك مایەوە و نوێژی خوێند و داوای پیرۆزی لەخوا کرد و بەهاوەڵانی خۆی وت: گومانم نیە قوتەیبە لەفەرمانەکەی خۆی پەشمیان بۆتەوە و ئەوەندە ناخایەنێت بۆ موغەیرە کوڕی عەبدالله نامە دەنوسێت و داوای لێدەکات من زیندانی بکات.

قوتەیبە لەو فەرمانەی بەنەیزەکیدا پەشمیان بویەوە و نامەی بۆ موغەیرە رەوانە کرد تا نەیزەك بگرێت و زیندانی بکات. نەیزەك بەرێکەوت و موغەیرە شوێنی کەوت و ئاگادار بویەوە کە ڕۆشتۆتە ناو دۆڵەکانی خولم. موغەیرە گەڕایەوە و نەیزەك نافەرمانی فەرمانی قوتەیبەی کرد و بۆ ئیسپەهبۆدی بەلخ، بازن پاشای مەروورود، پاشای تاڵەقان، پاشای فاریاب و پاشای جوزجان نامەی نوسی و بۆ دژایەتی کردنی قوتەیبە هانیدان. ئەوان بە بانگەوازەکەی رازی بون. نەیزەك بەهارانی دیاری کرد تا لەوێ کۆببنەوە و شەڕ لەگەڵ قوتەیبە بکەن. نامەی بۆ کابول شا نوسی و خوازیاری هاوکاری کردنی بو. سامان و کەل و پەلەکانی خۆی بۆ لای ئەو رەوانە کرد و داوای لێکرد ئەگەر ناچار بێت، پەنای ببەخشێت. کابول شا بەڵێنی هاوکاری پێدا.

جەبغویە پاشای تەخارستان پیاوێکی ناتەوان بو. نەیزەك ئەوی گرت و بەندێکی زێرینی لەدەست و پێی بەست تا رێگەی ناسازگاری لەگەڵ نەگرێتەبەر. جەبغویە پاشا بو و نەیزەك کۆیلەی ئەو. بەڵێنی لێوەرگرت و کارگوزاری قوتەیبەی لەوڵاتەکەی دەرکرد. پێش گەیشتنی زستان و پێش ئەوەی سوپاییەکان بڵاوەی لێبکەن، قوتەیبە ئاگادار بویەوە کە نەیزەك شۆرشی دەستپێکردوە. براکەی عەبدولرەحمان کوڕی موسلیمی هاورێ لەگەڵ دوانزە هەزار پیاوی شەرکەر بۆ بروقان رەوانە کرد و پێی وت: لەوێ بمێنەرەوە و هیچ کارێك مەکە تا زستان تەواو دەبێت. ئەوسا هێرش بکەسەر تەخارستان کە من لەتۆ نزیکم.

قوتەیبە بەرێکەوت و کاتێك زستان لەکۆتاییەکانی خۆی نزیك بویەوە، بۆ نەیشابور و شارەکانی دیکە نامەی نوسی تا سوپاییەکان پەیوەستی ببن. ئەوان پێش کاتی دیاریکراو لەدەوری ئەو کۆبونەوە و عەبدولرەحمان بەرەو تاڵەقان بەرێکەوت کە پاشاکەی لەگەڵ نەیزەك هاوپەیمان و ئالأی شۆڕشی هەڵکردبو. قوتەیبە هێرشی کردەسەر و کوشتارێکی گرانی لەناو خەڵکانی تاڵەقان بەرێخست و ژمارەیەکی زۆر لەوانی لەداردا کە لەدو ریزی بەرابەر تا چوار فەرسەخ درێژ بویەوە. ئەم ساڵە پێش لە شەڕی نەیزەك کۆتایی هات و ئێمە درێژەی کارەکانی نەیزەك لەکاتی گێڕانەوەی روداوەکانی ساڵی ٩١ کۆچی/ ٧١٠ زایینی، بەخواستی خوا، باس دەکەین.

## هەڵاتنی یەزید کوڕی موهەلیب و براکانی لەزیندانەکەی حەجاج

دەڵێن: لەم ساڵەدا یەزید کوڕی موهەلیب و براکانی کە لەزیندانەکەی حەجاجدابون، هەڵاتن. حەجاج ڕۆشتە رستەق ئاباد تا سوپاییەکان بۆ شەر رەوانە بکات چونکە کوردەکان دەستیان بەسەر وڵاتی فارسدا گرتبو. یەزید کوڕی موهەلیب و براکانی عەبدولەلیك و موفەزەل لەگەڵ سوپاییەکان لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. حەجاج سەنگەری بەدەروی خێوەتەکەیان هەڵکەندبو و ئەوانی لەنزیك خێوەتەکانی خۆیەوە دەست بەسەر و زیندانی کردبو. پاسەوانەکانی ئەوان لەخەڵکانی شام بون. ئەو داوای شەش هەزار دەرەمی لەوان دەکرد و بۆ وەرگرتنی ئەوانی ئەشکەنجە دەکرد و یەزید پیاوانە خۆڕاگری کرد و ئەمە زیاتر دەبوە هۆی توڕە بونی حەجاج. بەحەجاجیان وت تیرێکی بەرکەوتوە و نوکی تیرەکە بەشێوەیەك لەگۆشتی جەستەی چەقیوە کەئەگەر دەستی لێ بدەن، هاواری بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە. فەرمانیدا بەئازارادانی ئەو قاچەی ئەشکەنجەی بکەن. کاتێك ئەو کارەیان کرد، هاواری کرد. خوشکەکەی هند کچی موهەلیب هاوسەری حەجاج بو و کاتێك هاوار و ناڵەی براکەی بیست، قیژاندی و ناڵاندی. حەجاج تەڵاقیدا. دواتر دەستی لێهەڵگرتن و خوازیاری وەرگرتنی شەش هەزار درەمەکە بو. ئەوان هەوڵیاندا تا پارەکە کۆبکەنەوە و گیانی خۆیان رزگار بکەن. پەیامیان بۆ براکەیان مەروان لەبەسرە رەوانە کرد تا چەندین ئەسپ هەڵبگرێت و ببێتە دەستەبەریان و وا نیشان بدات کە مەبەستی فرۆشتنی ئەسپەکانی هەیە تا قەرزەکەی ئەوان بداتەوە. ئەو کارەی کرد. براکەی دیکەیان یانی حەبیب لەبەسرە لەژێر ئەشکەنجەدا بو.

یەزید بۆ پاسەوانەکان خواردنێکی ئامادە کرد و فەرمانیدا کە شەرابێکی زۆریان هێنا. ئەوان خواردیانەوە و سەرقاڵ بون. یەزید جل وبەرگی چێشت لێنەری لەبەر کرد و ریشێکی سپی هاوشێوەی ریشی ئەوی بۆ خۆی دروست کرد و هاتەدەر. یەکێك لەپاسەوانەکان ئەوی بینی و وتی: پێم وابێت یەزید بەمشێوەیە بەرێگادا دەڕۆشت. لێی نزیك کەوتەوە و بینی کە ریشی سپیە و لەبەر ئەمە وازی لێ هێنا و گەڕایەوە. موفەزەلیش هاتەدەر و کەس پێی نەزانی. سوار کەشتیەکی ئامادە بون: یەزید و موفەزەل و عەبدولمەلیك شەوانە بەرێکەوتن تا بەرەبەیان داهات. کاتێك بەیانی داهات، پاسەوانەکان ئاگادار بونەوە و ئەم هەواڵەیان بەحەجاج گەیاند. حەجاج ترسا و گومانی کرد ئەوان خەڵکانی خوراسان دژی ئەو هاندەدەن و دەست بەسەر ئەو سەرزەمینەدا دەگرن. نامەی بۆ قوتەیبە نوسی و ئاگاداری کردەوە.

کاتێك یەزید گەیشتە زۆلکاوەکان، سوارەکان پێشوازیان لێکرد و سواربون. رێنیشاندەرێك لەخەڵکانی کەلب هاورێیەتی ئەوانی دەکرد. ئەوان لەرێگەی سەماوە بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ شام بەرێکەوتن. دوای دو رۆژ ئەم هەواڵە بەحەجاج گەیشت و پێی وترا کە ئەوان رێگەی شامیان گرتۆتەبەر. حەجاج نامەی بۆ وەلید کوری عەبدولمەلیك نوسی و لەم کارە ئاگاداری کردەوە.

یەزید بەرێکەوت و لەفەلەستین لای وەهیب کوڕی عەبدولرەحمان ئەزدی دابەزی کەلای سلێمان کوری عەبدولمەلیك رێزدار بو. وەهیب ڕۆشتە لای سلێمان و لەبەسەرهاتی یەزید و براکانی ئاگاداری کردەوە و وتی لەترسی حەجاج پەنایان بۆ هێناوە. وتی: ئەوان بێنە لای من چونکە ئەمانیان هەیە و تا ئەو کاتەی من زیندوم دەستی کەس بەوان ناگات. ئەوان لەشوێنێکی ئارام و ئاسودەدا بون.

حەجاج نامەی بۆ وەلید نوسی: بنەماڵەی موهەلیب خیانەتیان لەئەمانەتی خوادا کردوە و لەدەستی من رایان کردن و پەنایان بۆ سلێمان برد. وەلید گومانی کردبو ئەوان بۆ ئاژاوە نانەوە رودەکەنە خوراسان. کاتێك زانی پەنایان بۆ براکەی خۆی بردوە، ئارام بویەوە بەڵام بۆ ئەو سامانەی لەگەڵ خۆیان بردبویان، داخی دەخوارد و تورە بو. سلێمان نامەی بۆ وەلید نوسی: یەزید لای منەوە و ئەمانم پێ بەخشیوە. ئەو تەنیا سێ هەزار هەزار درەم قەرزارە بەڵام حەجاج قەرزەکەی بەشەش هەزار درەم دەزانێت کە سێ

هەزار درهەمی داوە و پاشماوەکەی من دەیدەم. وەلید نوسی: سوێند بەخوا ئەمانی پێ نابەخشم تا بۆ لای من رەوانەی نەکەیت. سلێمان بۆی نوسی: ئەگەر ئەو بۆ لای تۆ رەوانە بکەم، خۆیشم لەگەڵی دێم. وەلید وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بێیت، ئەمانی پێ نابەخشم. یەزید وتی: من رەوانە بکە چونکە سوێند بەخوا نامەوێت لەنێوان ئێوەدا دوژمنایەتی دروست ببێت و حەز ناکەم خەڵکان من بەهۆکاری ئەم ئاژاوەیە بزانن. نامەیەکی بۆ بنوسە و داوای بەخشینی منی لێبکە.

سلێمان ئەوی لەگەڵ ئەیوبی کوڕی رەوانە کرد. وەلید فەرمانیدا زنجیر لەدەست و پێی بکات و رەوانەی بکات. سلێمان بەکوڕەکەی وت: کاتێك گەشتنە لای سەروەری باوەڕداران، تۆ لەگەڵ یەزید لەناو یەك زنجیر بڕۆنە ژوور. ئەو کارەی کرد. کاتێك وەلید برازاکەی خۆی لەزنجیردابینی، وتی: سلێمان منی شەرمەزار کرد. ئەیوب نامەکەی باوکی بەمامی سپارد و پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، گیانم قوربانی تۆ بێت، ئەمانەکەی باوکم بەفیڕۆ مەدە چونکە شیاوترین کەسی رێز لەئەمانەکەی بگریت. هیوای کەسێك لەناو مەبە کە بەهیوایی رزگار بون و تەندروستی لای ئێمە پەنای بۆ ئێمە هێناوە. ئەو کەسەی بەهیوایی بەخشینی تۆ روی لەبارەگاکەت کردوە، ریسوا مەکە. وەلید نامەکەی سلێمانی خوێندەوە و بینی سلێمان داوای کردوە ببێتە نێوەنجیگەر و بەڵێنی داوە قەرزەکەی یەزید کوڕی موهەلیب بداتەوە. کاتێك نامەکەی خوێندەوە، وتی: بارودۆخمان لەسلێمان دژوار کرد. یەزید قسەی کرد و داوای بەخشینی کرد و وەلید ئەمانی پێبەخشی وبۆ لای سلێمان گەڕایەوە. وەلید بۆ حەجاجی نوسی: چونکە یەزید و براکانی پەنایان بۆ براکەم برد، نەمتوانی هیچیان لەگەڵ بکەم، دەستبەرداری ئەوان ببە. حەجاج ئەو کارەی کرد.

ئەبو عویەیینە کوڕی موهەلیب لای حەجاج بو و هەزار هەزار درەم قەرزی لەئەستۆدا بو کەوازی لەقەرزەکەی هێنا و حەبیب کوڕی موهەلیبی ئازاد کرد.

یەزید کوڕی موهەلیب لای سلێمان مایەوە و بەردەوام خواردنی بۆ دروست دەکرد و دیاری پێشکەش دەکرد. یەزید هیچ دیاریەکی بۆ نەدەهات مەگەر ئەوەی بۆ سلێمانی دەنارد و سلێمان هیچ دیاریەکی پێنەدەگەیشت مەگەر ئەوەی نیوەی بەیەزید دەبەخشی و هیچ کەنیزێکی هەڵنەدەبژارد مەگەر ئەوەی بۆ یەزیدی رەوانە دەکرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و پێنج قەلاَکەی سوریيەی گرت.

عەباس کوڕی وەلید بۆ شەڕ رەوانە بو تا گەیشتە ئەرزەن و سەرزەمینی سوريیەی بڕی.

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عەبدولمەلیك ، قورە کوڕی شەریکی کردە فەرمانڕەوای میسر و براکەی عەبداللە کوڕی عەبدولمەلیکی لەسەر کار لابرد.

هەروەها لەم ساڵەدا رۆمیەکان خالید کوڕی کیسان پاشای دەریایان بەئەسیری گرت و پاشاکەیان ئەوی وەك دیاری بۆ دەرباری وەلید رەوانە کرد.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز فەرمانداری مەدینە و مەککە و تایف لەگەڵ خەڵکان ئاییی حەجی بەجێهێنا.

فەرمانڕەوای عێراق و سەراسەری رۆژهەلاَت حەجاج کوڕی یوسف بو و کارگوزارەکەی لەبەسرە جەراح کوڕی عەبداللە حەکەمی و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە عەبدولرەحمان کوڕی ئۆزەینە، فەرمانداری خوراسان قوتەیبە کوڕی موسلیم و فەرمانداری میسر قورە کوڕی شەریك.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: مالك کوڕی ئەنسی ئەنساری کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧١١/٩٢ یا ٩٣/ ٧١٢ زایینی لەتەمەنی ٩٦ ساڵی یا ١٠٦ ساڵی یا ١٠٧ ساڵی یا ١٠٣ ساڵی کۆچی دوایی کرد، ئەبو ئەلعالیەی ریاحی لەشوال/ نوتی ٧٠٩ زایینی، ئەسر کوڕی عاصمی لەیسی ئەحوی کە رێزمانی زمانی عەرەبی لە ئەبوالاسوەدی دوئەلی فێر بو. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٩٠/ ٧٠٩ زایینی کۆچی دوایی کرد.

## رووداوەکانی ساڵی نەوەد و یەکی کۆچی ( ٧١٠ زایینی )

## درێژەی بەسەرهاتەکانی قوتەیبە لەگەڵ نەیزەك

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە نەیزەك لەقوتەیبە جیابویەوە و رویکردە تاڵەقان و قوتەیبە بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت و خەڵکانێکی زۆری کوشتار کرد. کاتێك دەستی بەسەر تاڵەقاندا گرت، براکەی عەمرۆ کوڕی موسلیمی وەك فەرمانداری ئەو سەرزەمینە دیاری کرد. دەستەیەك دەڵێن: پاشاکەی شەڕی لەگەڵ قوتەیبە نەکرد و قوتەیبە ئازاری بەو نەگەیاند. دز و رێگرەکان لەو سەرزەمینە بون کە قوتەیبە ئەوانی کوشتار کرد. دواتر قوتەیبە بەرەو فاریاب بەرێکەوت و پاشاکەی رێگەی سازگاری گرتەبەر و داوای بەخشینی کرد. قوتەیبە ئەوی بەخشی و کەسی نەکوشت و عامر کوڕی مالکی حەمانی وەك کارگوزاری خۆی دەست نیشان کرد.

بەرەو بەلخ بەرێکەوت کە خەڵکەکەی پێشوازیان لێکرد بەڵام ئەو تەنیا بۆ ماوەی یەك رۆژ لەوێ مایەوە و بەدوای براکەی خۆی یانی عەبدولرەحمان بەرێکەوت تا لەدۆڵی خولم هاوکاری بکات. نەیزەك بەرەو بەغلان بەرێکەوت و شەرکەرانی خۆی لەلێواری دۆڵەکە و دربەندەکان جێگیر کرد تا پارێزگاری لێبکەن. دەستەیەکی دیکە لەشەرکەرانی خۆی لەپشتی دۆڵەکە بۆ پاسەوانی کردن جێگیر کرد. قوتەیبە چەندین رۆژ لەوێ مایەوە و لەنزیك دۆڵەکە شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد بەڵام نەیتوانی بڕواتە ناو دۆڵەکە و هیچ رێگەیەکی نەدەزانی تا خۆی بەنەیزەك بگەیێنێت مەگەر دۆڵ یا بیابانێك کە سوپاکەی نەیاندەتوانی لێی تێپەڕ بکەن. لەبەر ئەمە سەرگەردان مایەوە. پیاوێك هات و داوای ئەمانی لێکرد بەو مەرجەی بۆ رێگەی چونە ناوەوی پشت دۆڵەکەی نیشان بدات. قوتەیبە ئەمانی پێبەخشی و پیاوێکی لەگەڵ رەوانە کرد کەئەوانی لەپشت دۆڵی خولمەوە بۆ ناو قەڵاکە رێنوێنی کرد. سوپاکەی نەیزەك ئاسودە بون کە سوپاکەی قوتەیبە شەوانە هێرشیان کردە سەریان وکوشتاریان کردن. ئەوانەی زیندو مانەوە بۆ قوڵایی دۆڵەکە رایان کرد. قوتەیبە ڕۆشتە ناو دۆڵەکە و دواتر قەڵاکە و لەوێوە بەرەو سەمنگان بەرێکەوت. چەند رۆژێك لەوێ مایەوە و ئەوسا شوێنپێی نەیزەکی هەڵگرت و

براکەی عەبدولرەحمانی وەك پێشەنگی خۆی رەوانە کرد.

نەیزەك لەماڵەکەی خۆی کۆچی کرد و دۆڵی فەرغانەی بڕی و باروبنە و سامانەکەی خۆی بۆ لای کابول شا رەوانە کرد. بەرێکەوت تا لەکورز دابەزی و عەبدولرەحمان بەدوایەوە بو. عەبدولرەحمان لەبەرابەر کورز دابەزی و قوتەیبە لەشوێنێك کەدوریەکەی لەعەبدولرەحمان تەنیا دو فەرسەخ بو. نەیزەك لەکورز سەنگەری گرت و ئەمان بینیان هیچ رێگەیەك نیە بۆ ئەوەی دەستیان بەنەیزەك بگات مەگەر دۆڵێك کە چوارپێکان نەیاندەتوانی لەو رێگەوە برۆن. قوتەیبە بۆ ماوەی دو مانگ گەمارۆی خستەسەر تا ئەوەی خواردن و خۆراکی نەیزەك روی لەکەمبون کرد و نەخۆشی ئاوڵە لەناو سوپاکەی بڵاوبویەوە و جەبغویەییش بەم نەخۆشیە گرفتار بو.

قوتەیبە لەزستان ترسا. سەلیمی ئامۆژگاری بانگ کرد و پێی وت: برۆ لای نەیزەك و پلانی فریوێك دابرێژە تا بیهێنیتە لای من. ئەگەر فریونەدرا و رازی نەبو، ئەمانی پێ ببەخشە و بزانە ئەگەر لەکاتی گەڕانەوە ئەو لەگەڵ تۆدا نەبینم، دەتکوژم. وتی: نامە بۆ عەبدولرەحمان بنوسە تا ناسازگاری لەگەڵ من نەکات. قوتەیبە نامەی بۆ نوسی و سەلیم رۆشتە لای عەبدولرەحمان و پێی وت: چەندین کەس رەوانە بکە تا لەلێواری دۆڵەکەدا جێگیر ببن و کاتێك من لەگەڵ نەیزەك دێمەدەر، لەپشتەوە هێرش بکەنە سەر ئێمە و لەنێوان ئێمە و دۆڵەکە جیایی دروست بکەن. عەبدولرەحمان چەندین شەرکەری رەوانە کرد کەسوار لەسەر ئەسپ لەو شوێنەدا وەستان. سەلید چەند بارێکی قورسی خواردن و شیرینی و شتی دیکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و رۆشتە لای نەیزەك و پێی وت: تۆ فێڵت لەقوتەیبە کرد و رێگەی ناسازگاریت گرتەبەر. نەیزەك پرسی: بۆچونی تۆ چیە؟ سەلیم وتی: بۆچونی من ئەوەیە برۆیتە لای ئەو، چونکە ئەو لەم سەرزەمینە ناڕوات، قوتەیبە سوێندی خواردوە چ لەناو بچێت چ رزگاری بێت، زستان لەم سەرزەمینە بەسەر ببات. نەیزەك پرسی: چۆن بێ بەخشینی ئەمان برۆمە لای ئەو؟ سەلیم وتی: گومان ناکەم ئەمان بەتۆ ببەخشیت چونکە کینەی تۆی لەدڵدایە و دڵی لێوانلێوە لەرق و توڕەیی، بەڵام بەگومانی من باشتر وایە لەهاتنی تۆ ئاگادار نەبێت تا کاتێك دەست دەخەیتە ناو دەستی، چونکە هیوادارم شەرم دایگرێت و لەتۆ خۆش ببێت. نەیزەك وتی: گیانم ئەم کارەی پێ خۆش نیە و ئەگەر بمبینێت، دەمکوژێت. سەلیم وتی: هاتوم بۆ لای

تۆ بۆ ئەوەی پێشنیاری چاکەت پێ بکەم، ئەگەر گوێ لەپێشنیارەکانی من بگریت، هیوادارم رزگارت بێت، ئەگەر ناخوازیت، دەگەڕێمەوە.

سەلیم خواردنەکانی خۆی هێنا کە هاوشێوەی ئەوەیان نەبینیبو. یارانی نەیزەك تاڵانیان کرد و نەیزەك لەم کارە رەنجا. سەلیم وتی: من ئامۆژگاری تۆ دەکەم چونکە چاکەخوازی تۆم. دەبینم سوپاکە بێزاربون وئەگەر ئەم گەمارۆیە درێژە بکێشێت، دڵنیام ئەوان لەگەڵ تۆ نامێنن و پارێزگاریت لێ ناکەن، برۆ بۆ لای قوتەیبە. نەیزەك وتی: لەگیانم دەترسم. تەنیا کاتێك دەڕۆمە لای کە ئەمانم پێ ببەخشێت، هەرچەند دەزانم بەو شێوەیش دەمکوژێت بەڵام ئەمە لای من پەسەندترە. سەلیم وتی: ئەمانی پێ بەخشیویت، ئایا من بەراستگۆ نازانیت؟ وتی: نە. هاوەڵانی پێیان وت: بەوتەکانی رازی ببە چونکە سەلیم تەنیا راستی دەهێنێتە سەر زمان.

نەیزەك هاتەدەر و صول و جەغبویە و صول تەرخان جێگری جەغبویە هاورێیەتیان دەکرد و تەرخان، فەرماندەی پاسەوانەکان و شەقران برازاکەی نەیزەکی خستە زیندان. کاتێك لەدۆڵەکە هاتنەدەر، ئەو سوارانەی عەبدولرەحمان جێگیری کردبون، هێرشیان کردنەسەر و رێگریان لەتورکەکان(هاوەڵانی نەیزەك)گرت. نەیزەك پێی وت: ئەمە سەرەتای فریوەکەتانە. سەلیم وتی: نەهاتنی ئەوان بۆ تۆ باشترە. سەلیم و نەیزەك و هاورێکانی بەرێکەوتن و رۆشتنە لای قوتەیبە. ئەوانی خستە زیندان و نامەی بۆ حەجاج نوسی و داوای لێکرد تا فەرمانی کوشتنی نەیزەك بدات. قوتەیبە معاویە کوڕی عامر کوڕی عەلقەمەی عولەیمی رەوانە کرد کە هەمو کاڵاکان و هەموئەو کەسانەی لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد، لەگەڵ ئەودا رەوانەی کرد. قوتەیبە چاوەڕێی کرد تا نامەی حەجاج گەیشت. نامەی حەجاج چل رۆژ دوای ئەوە گەیشت و فەرمانی کوشتنی نەیزەکی تیا نوسرا بو. قوتەیبە خەڵکی کۆکردەوە و سەبارەت بەکوشتنی ئەو راوێژی لەگەڵ کردن. بەشێوەی ناسازگار گفتوگۆیان کرد. زێرار کوڕی حوصەین وتی: لەتۆم بیست کە دەتوت: پەیمانی خوام لەملدا بێت ئەگەر دەستم بەنەیزەك بگات، خوێنی دەرێژم. ئەگەر نەیکوژێت، خوا هیچ کات تۆ بەسەر ئەودا سەرکەوتو ناکات.

نەیزەکی بانگ کرد و سەری ئەوی بەدەستی خۆی بڕی و فەرمانی کوشتنی صول و برازاکەی نەیزەکی دەرکرد. لەسوپاکەی نەیزەك حەوتسەد (یا دوانزە هەزار کەسیان)

سەربڕی و نەیزەك و برازاكەیان لەداردا و سەری ئەو دوانەیان بۆ حەجاج رەوانە كرد. ئەهار كوڕی تەوسعە سەبارەت بەكوژرانی نەیزەك وتی:

لعمری لنعمت غزوة الجند غزوة          قضت نحبها من نیزك و تعلت

یانی: سوێند بەگیانی خۆم شەڕی ئەم سوپایە شەڕێكی پەسەندكراو بو كە دادی دڵیان لەنەیزەك وەرگرت و سەرفراز گەڕانەوە.

زەنیر كۆیلەی عەباسی باهلی كیسەیەكی نەیزەكی هەڵگرت كەچەندین گەوهەری تیا بو و زۆربەی دارایی و خەرجی سەرزەمینەكانی ئەو لەو گەوهەرانە دابین دەكرا. جەبغویەی ئازاد و منەتباری كرد و بۆ لای وەلید رەوانەی كرد كە لەوێ مایەوە تا وەلید مرد.

خەڵكان دەیانوت: نەیزەك بەفریوی قوتەیبە كوژرا. یەكێك وتی:

فلا تحسبن الغدر حزما فربما          ترقت به الاقدام یوما فزلت

یانی: هەرگیز فریو بەدورئەندێشی مەزانە چونكە زۆرجار هەنگاوەكان بەپایەكەیدا سەردەكەون و لەسەرەوە بۆ خوارەوە تلێر دەبنەوە.

كاتێك قوتەیبە نەیزەكی كوشت، بۆ مەرو گەڕایەوە و پاشای جوزجان كەسی رەوانە كرد و داوای ئەمانی كرد. قوتەیبە ئەمانی پێ بەخشی لەسەر ئەو بنەمای كەبڕواتە لای. ئەو داوای بارمتەی كرد. قوتەیبە، حەبیب كوڕی عەبدالله باهلی بۆ لای ئەو رەوانە كرد و پاشای جوزجان چەندین كەسی وەك بارمتە بۆ لای قوتەیبە رەوانە كرد و خۆی بەرێكەوت و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و گەڕایەوە و لەتاڵەقان مرد. خەڵكانی جوزجان وتیان: ژەهرخواردیان كردوە. لەبەر ئەمە حەبیبیان كوشت و قوتەیبەیش بارمتەكانی سەری بڕی.

## شەڕی شومان و كێش و نەسەف

لەم ساڵەدا قوتەیبە ڕۆشتە شومان و گەمارۆی خستەسەر.

هۆكاری ئەم كارە ئەوە بو كەپاشاكەی كارگوزارەكەی قوتەیبەی دەركرد. قوتەیبە دو نێردراوی بۆ لای ئەو رەوانە كرد. یەكیان لەعەرەبەكان بەناوی عەیاش و ئەویتریان لەخەڵكانی خوراسان. ئەوانی رەوانە كرد تا داوا لەپاشای شومان بكەن تا ئەوەی لەپەیمانی ئاشتیەكە لەئەستۆی گرتوە، جێبەجێ بكات. ئەم دوانە ڕۆشتنە لای شومان.

خەڵك روبەرویان بونەوە و تیربارانیان کردن. خوراسانیەکە گەڕایەوە و عەیاش لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد کەکوشتیان و شوێنەواری شەست برینیان لەسەر جەستەی دۆزیەوە.

قوتەیبە خۆی بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەوێ، ساڵح کوڕی موسلیم برای قوتەیبە پیاوێکی بۆ لای پاشاکە رەوانە کرد و داوای لێکرد گوێڕایەڵ و ملکەچی خۆی نیشان بدات و بەڵێنیدا ئەگەر رێگەی ئاشتی بگرێتەبەر، رەزامەندی قوتەیبە بۆ ئەو بەدەست دێنێت. ساڵح لەگەڵ پاشاکە هاورێ بو. پاشا رازی نەبو و وتی: من پارێزراوترینی پاشاکانم، ئایا من لەقوتەیبە دەترسێنیت؟ ئەو سەنگەری هەڵکەند و قوتەیبە هێرشی کردە سەر و کەشکەنجیرەکانی بۆ دانا و قەڵاکەی ئەوی بەردباران کرد و پیاوێکی لەنزیکەکەکانی پاشا کوشت. کاتێك ترسی زاڵبونی قوتەیبەی کەوتە دڵ، هەرچی سامان و زێر و زیوی بو، کۆی کردەوە و خستیە ناو چاڵێك کە کەس قولاییەکەی نەدەزانی. دواتر قەڵاکەی کردەوە و روبەرویان بویەوە و شەڕی کرد تا کوژرا. قوتەیبە بەزۆر دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت و شەرکەرانی کوشت و ژنان و مناڵانی ئەسیر کرد.

دواتر بەرەو کێش و نەسەف بەرێکەوت و ئەم دوشارەی گرت. شاری فاریابی سوتاند چونکە لەبەرابەر ئەو خۆڕاگریان کرد و دوای ئەوە بەشاری سوتاو ناوی دەرکرد. عەبدولرەحمانی برای لەکێش و نەسەفەوە بۆ سەغد رەوانە کرد کە پاشاکەی تەرخون بو. عەبدولرەحمان هەمو بەندەکانی پەیمان نامەی ئاشتی لێ سەند و بارمتەکانی تەسلیم کرد و گەڕایەوە بۆ بوخارا بۆ لای قوتەیبە کە لەکێش و نەسەفەوە بۆ ئەو شارە رۆشتبو. ئەوان بۆ مەرو گەڕانەوە. کاتێك قوتەیبە لەبوخارا بو، بوخارا خوداە کە گەنجێکی تازە پێگەیشتوبو، وەك پاشای ئەو شارە دەستنیشانی کرد و ئەو کەسانەی لەناو برد کەگومانی دەکرد رێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەو پاشایە دەگرنەبەر.

دەڵێن: قوتەیبە خۆی رۆشتە سەغد. کاتێك گەڕایەوە، خەڵکانی سەغد وتیان: تۆ بەریسوایی و دانی باج رازی بویت لەگەڵ ئەوەی پیرەپیاوێکی بەتەمەنی، ئێمە پێویستیمان بەتۆ نیە. تەرخون خۆی کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

دەڵێن: لەم ساڵەدا وەلید، خالید کوڕی عەبدالڵەی قەسری وەك فەرمانداری مەککە دەستنیشان کرد. خالید تا کاتی مردنی وەلید فەرماندار بو. پێشتر لەساڵی ٨٩/ ٧٠٨ زایینی ئاماژەمان بەم گێڕانەوەیەدا. کاتێك بوبە فەرمانداری مەککە، وتارێکی پێشکەشی خەڵك کرد و کاری خەلافەتی لەبەرچاوی ئەواندا بەگەورە نیشاندا و داوای فەرمانبردن و گوێڕایەڵی لێکردن و وتی: ئەگەر بزانم ئەم ئاژەڵە کێویی و دەشتیانە کە لەناو بارەگایی خوایی هاتوچۆ دەکەن، کاتێك دێنە قسە، زمان بۆ نافەرمانی و ناسازگاری دەکەنەوە، دەریان دەپەڕێنم. ئەرکی سەرشانی ئێوەیە فەرمانبەر و لەگەڵ خەڵکان هاودەنگ بن چونکە سوێند بەخوا هەر کەس بێننە لای من و بڵێن خراپەی دژی سەروەری باوەڕداران وتوە، لەبارەگایی خواییدا لەداری دەدەم. من ئەنجامداری بێ چەند و چونی فەرمان و نوسراوەکانی خەلیفەم. تەنگی بەخەڵکان هەڵچنی.

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عەبدولمەلیك حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. کاتێك ڕۆشتە ناو مەدینە، ڕۆشتە ناو مزگەوتەوە و سەیری بیناکەی کرد. خەڵکانیان لەمزگەوت کردەدەر جگە لەسەعید کوڕی موسەییب کە هیچ کام لەپاسەوانەکان بوێری دەرکردنی ئەویان نەبو. پێیان وت: باشترە لەشوێنەکەت هەستیت. وتی: هەڵناستم مەگەر ئەو کاتەی هەمیشە هەڵدەستم. وتیان: باشترە سڵاو بۆ سەرورەی باوەڕداران بنێریت. وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: بەردەوام ئەوم لەسوچ و قوژبنەکانی مزگەوتەکەدا دەسوراندەوە تا نەیبینێت. وەلید روی کردە قیبلە و سەعیدی بینی و وتی: ئەو پیرە پیاوە کێیە؟ سەعیدە؟ عومەر وتی: بەڵێ سەعیدە و ئەمە حاڵ و کاریەتی و ئەگەر بزانێت تۆ لێرەیت، دێت و سڵاوت بۆ دەنێرێت بەلام پیرە و سۆمایی چاوەکانی کزە. وەلید وتی: تێگەیشتم، ئێستا ئێمە دەڕۆینە لای. بەرێکەوت تا گەیشتە لای و وتی: ئەی پیرەپیاو چۆنی؟. سوێند بەخوا سەعید لەشوێنەکەی نەجولا و وتی: سوپاس بۆ خوا کەباشم، سەروەری باوەڕداران چۆنە و چۆن دەژیت؟ وەلید گەڕایەوە و وتی: ئەمە پاشماوەی پیاوەکانە.

لەمەدینە بڕێکی فراوان سامان و دەفرە زێڕین و زێوینەکانی دابەش کرد. نوێژی هەینی خوێند و وتاری یەکەمی بەدانیشتانەوە خوێندەوە و دواتر هەستایە سەرپێ و

وتاری دووەمی پێشکەش کرد. ئیسحاق کوڕی یەحیا دەڵێت: بەرەجاعکوڕی حەیوە (لەگەڵ وەلید دابو) وتم: ئایا ئەم کارە دەکەن؟ وتی: بەڵێ، زۆرجار. معاویە ئەم کارەی دەکرد و کەسانیتر بەدوای ئەودا درێژەیان بەم کارەدا. پێیان وت: بۆ لەمبارەوە قسەی لەگەڵ ناکەیت؟ وتی: گێڕایەوە کە قەبیصە کوڕی زوەیب لەمبارەوە قسەی لەگەڵ عەبدولەلیک کرد بەلام گوێی لێنەگرت. وتی: عوسمان بەم شێوەیە وتارەکانی دەخوێندەوە. دەڵێت: وتم: سوێند بەخوا لەسەر پێ دەوەستا و وتارەکەی پێشکەش دەکرد. رەجا ءوتی: بەمشێوە بۆ ئەوانیان گێڕاوەتەوە و ئەوان درێژە بەم کارە دەدەن. ئیسحاق دەڵێت: لەناو خەلیفەکان کەسم نەبینیوە لەو سەرکێشتر و ستەمکارتر.

فەرمانداری شارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێش بون جگە لەمەککە کە فەرمانداەرەکەی خالید کوڕی عەبداللەی قەسری بو. دەستەیەك دەڵێن: کارگوزارەکەی وەلید لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی مەروان بو.

لەم ساڵەدا عەبدولعەزیز کوڕی مەروان شەڕی هاوینەی کرد. فەرماندەی سوپاکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك بو.

هەروەها لەم ساڵەدا وەلید مامەکەی خۆی لەفەرمانداری جەزیرە و ئەرمەنستان لابرد و براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیکی لەجێگەکەی ئەودانا. مەسلەمە لەپانتاییەکانی ئازەربایەجان شەڕی لەگەڵ تورکەکان کرد تا گەشتە باس و و دەستی بەسەر شار و قەلاّکاندا گرت و کەشکەنجیرەکانی دانا.

## روداوەکانی ساڵی نەوەد و دووەمی کۆچی ( ٧١١ زایینی )

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و دەستی بەسەر سێ قەڵاکەدا گرت و کۆچی بەخەڵکی سوێسنەی کرد بۆ سەرزەمینی رۆم.

## دەست بەسەرداگرتنی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا تارق کوڕی زیاد کۆیلەی موسا کوڕی نوصەیر لەگەڵ دوانزە هەزار پیاوی شەڕکەر هێرشی کردە سەر ئاندۆلۆس و روبەروی پاشاکەیان بویەوە کە ناوی ئازەرینۆگ بو لەخەڵکانی ئیسفەهان لەپاشاکانی عەجەمی ئاندۆلۆس. تارق بەسوپاکەی خۆی هێرشی کردەسەریان و ئازەرینۆگ لەگەڵ سوپاکەی خۆی پێشڕەوی کرد. تاجی پاشایەتی لەسەر نابو و هەمو زێر وزیو و جلە گرانباییەکانی تایبەت بەپاشاکانی لەبەر کردبو. شەڕێکی دژوار و قورسیان کرد و ئازەرینۆگیان کوشت و ئاندۆلۆس دەستی بەسەرداگیرا. ئەم روداوە لەساڵی ٧١١/٩٢ زایینی رویدا.

ئەمە، ئەو گێڕانەوەیە ئەبو جەعفەری تەبەری سەبارەت بەگرتنی ئاندۆلۆس ئاماژەی پێداوە بەلاّم لەناوچەیەکی بەو گەورەییە و بەم سەرکەوتنە بایەخدارە نابێت تەنیا بەم گێڕانەوەیە بەسەندە بکرێت. من بەشێوەیەکی بەربلاّو ئاماژە بەچۆنیەتی گرتنی ئەو شارە دەکەم و مێژووەکەی بەپێی نوسراوەی خەڵکەکان ئاماژە پێدەدەم چونکە ئەوان خۆیان لەمێژووی شارەکەیان شارەزاتر و ئاگادارترن.

## مێژووی ئاندۆلۆس لەسەرەتاوە

دەڵێن: یەکەمین خەڵکان کە لەو سەرزەمینە نیشتەجێ بون، لەرەگەزێك بەناوی ئاندۆلۆس بون کەولاّتەکەیان بەناوی خۆیانەوە ناوی دەرکرد. دواتر ناوەکە بوبە عەرەبی و گۆڕا بۆ ئاندۆلۆس. مەسیحیەکان ئاندۆلۆس بە (ئیشبانیە (ئیسپانیا) ناو دەبەن و ئەمە لەناوی پیاوێك بەناوی ئیشبانس وەرگیراوە کە لەوێ لەداردرا. دەستەیەك دەڵێن: بەناوی پاشایەك لەرۆژگاری کۆن کە پێیان دەوت ئیشبان کوڕی تیتس. بەتڵیموس ئاماژەی بەم ناوەداوە. دەستەیەك دەڵێن: لە ناوی ئاندۆلۆس کوڕی یافس کوڕی نوحەوە

وەرگیراوە چونکە یەکەم کەس بو ئەو ناوچەی ئاوەدان کردەوە. دەستەیەك دەڵێن: یەکەم خەڵکان کە دوای تۆفانەکەی نوح لەوێ مانەوە، خەڵکانێك بون پێیان دەوت ئاندۆلۆسیەکان کە ئەو سەرزەمینەیان ئاوەدان کردەوە و ئاگر پەرەست بون و پاشایەتی بۆ رۆژگارێکی درێژ لەناو خۆیاندا بەردەوام بو. دواتر خوا گیرۆدەی وشکەساڵی کردن کە بۆ چەندین ساڵ بەردەوام بو و زۆربەیان لەناوچون و ئەوانەی توانای هەڵاتنیان بو، هەڵاتن و ئاندۆلۆس بۆ ماوەی سەد ساڵێك کەسی تیا نەدەژیا. دواتر خواوەند ئەفریقیەکانی بۆ ئاوەدان کردنەوەی ئەو سەرزەمینە رەوانە کرد و خەڵکانێك رۆشتنە ناو ئەو سەرزەمینە کە پاشای ئەفریقیە بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی دانیشتوانەکەی (بەدوای وشکەساڵی بەردەوام لەسنوری فەرمانرەوایەتی خۆی کە خەڵکەکەی لەفەوتان نزیك ببونەوە) ئەوانی بۆ ئەو دیارە رەوانە کرد. ئەوانی هاورێ لەگەڵ فەرماندەیەك لەکەسەکانی خۆی سوار کەشتیەکان کرد کە لەدورگەی قادس لەنگەریان خست و ئاندۆلۆسیان بینی کە سەرزەمینەکانی سەرسەوز و روبارەکانی لێوانلێوە لەئاو. لەوێ مانەوە و ئەو سەرزەمینەیان ئاوەدان کردەوە و پاشایەکیان بۆ خۆیان دەستنیشان کرد تا فەرمانرەوایەتی ئەوان بگرێتەدەست و کاروبارەکانیان رابەرێنێت. ئەوان لەسەر ئاینی پێشینانی خۆیان بون و پایتەختەکەیان (تاڵقەی وێران) لەپانتاییەکانی ئەشبیلە بوکە بناغەیان دارشت و ئاوەدانیان کردەوە و ماڵەکانیان لەوێ دروست کرد و بۆ ماوەی سەد و پەنجا ساڵ لەوێ ژیانیان بەسەر برد. بەدرێژایی ئەم رۆژگارە پانزە پاشا فەرمانرەوایەتی ئەوانیان کرد.

دواتر خواوەند عەجەمەکانی رۆمی رەوانە کرد کە پاشاکەیان ئیشبان کوری تیتس بو. شەری لەگەڵ ئەوان کرد و کوشتاری کردن و گەمارۆیان خستە سەر پایتەختەکەی ئەوان چونکە لەو شارەدا سەنگەریان گرتبو. ئەو لەبەرابەر ئەوان ئیشبانیەی دروست کرد و وەك پایتەختی خۆی هەڵبیژارد. ژمارەی سوپاکەی فراوان بو و بەم پێیە ستەمکاری دەست پێکرد. هێرشی کردە سەر بیت المقدس و تاڵانی کرد و لەو شارە سەد هەزار شەرکەری کوشت و بەردە مەرمەرەکانی بۆ ئیشبانیە و ناوچەکانی دیکەی سەرزەمینەکەی گواستەوە و خوانی (سفرە) سلێمان کوری داوودی تاڵان کرد. ئەمە ئەو خوانەیە تارق کوری زیاد لەکاتی گرتنی تەلێتەڵە دەستی بەسەردا گرت لەگەڵ گۆی

زێرین و بەردێکی قورس کە لەمارده دۆزرایەوە.

ئەم پیاوە ئەشبان بو کە خزر لەکاتی کێلانی زەوی ئەوی بینی وپێی وت: ئەی ئیشبان، بەم زوانە رۆژێك دەگات بەختەوەر دەبیت و دەبیتە پاشا و لەپێشیت پێ دەبرێت. کاتێك ئیلیایی مێهرەبان بێتەسەر کار، لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەر بەنەرمی هەڵس و کەوت بکە. ئیشبان وتی: ئایا گاڵتەم پێدەکەیت؟ کەسێکی وەك من چۆن دەتوانێت ببێتە پاشا؟ خزر وتی: ئەو کەسە پاشایەتی بەتۆ بەخشی کە داردەستەکەی تۆی بەمشێوەیە دروست کرد. ئیشبان سەیری داردەستەکەی کرد و بینی گەڵا و گوڵی کردوە. ترسا و خزر لەبەرچاویدا نەما. ئیشبان باوەڕی بەوتەکانی کرد. گەڕایەوە بۆ ناو خەڵکەکەی و پلەکانی پێشکەوتنی بڕی تا ئەوەی بو بەپاشای ولاتێکی گەورە و بۆ ماوەی بیست ساڵ پاشایەتی کرد. پاشایەتی ئیشبانیەکان دوای ئەو بەردەوام بو و پەنجا و پێنج کەس لەوان فەرمانڕەوایەتیان کرد.

دواتر کەسانێك بەناوی بشنولیات لەعەجەمەکان لەبەرابەر ئەوان دابەزین. پاشاکەیان تەیش کوڕی نیتە بو و ئەمە کاتی دەرکەوتنی عیسا مەسیح بو. خەڵکی بشنولیات بەسەر ئەو سەرزەمینەدا زاڵبون و پاشایەتیان گرتەدەست. پایتەختەکەیان شاری مارده بو و بیست و حەوت کەس لەوان بونە پاشا.

دواتر خەڵکانی گوت لەگەڵ پاشاکەیان هێرشیان کردە سەریان و بەسەر ئاندۆلۆسدا زاڵبون و لەم کاتەوە ئەوانیان لەپاشای شارەکانی رۆم جیا کردەوە. دەرکەوتنی ئەوان لەپانتاییەکانی ئیتاڵیە (ئیتالیا) لەرۆژهەلاتی ئاندۆلۆس بو. ئەوان هێرشیان کردە سەر سەرزەمینەکانی مەجدونیە لەو ناوچەیە و ئەمە لەرۆژگاری سزار کلیۆزیوس (سێیەم سزار) رویدا کە روبەرویان بویەوە و ئەوانی شکستدا و کوشتاری کردن. دوای ئەوە تا رۆژگاری کۆنستانتین پاشایەتیان دەست نەکەوتەوە. لەرۆژگاری ئەو جارێکی دیکە هێرشیان کردەوە. ئەوسوپایەکی بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد کە لەبەرابەر ئەو نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن و گێڕانەوەی مێژووی ئەوان تا رۆژگاری فەرمانڕەوایی سزار ونبوە. ئەوان شازادیەك بەناوی لەزریکیان کردە فەرمانڕەوایی خۆیان. ئەو بتپەرەست بو. بەرەو شارەکانی رۆم بەرێکەوت تا مەسیحیەکان بۆ پەرستینی بتەکان ناچار بکات. کردارێکی قێزەونی لێ بینرا و هاوەلانی لەدەوری ئەو بلاوەیان لێکرد و لەدوری براکەی

کۆبونەوە و شەڕیان لەگەڵ ئەو کرد. داوای هاوکاری لەپاشای رۆم کرد کە سوپایەکی بۆ هاوکاری کردنی ئەو رەوانە کرد. براکەی شکستی خوارد و باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا. فەرمانڕەوایەتی ئەو سیانزە ساڵ بو. دوای ئەو ئێکریت و دوای ئەو ئێملریك و دواتر وەگدیش بەپاشایەتی گەیشتن و دووبارە گەڕانەوە سەر ئایینی بتپەرەستی. ئەو سەد هەزار کەسی لەهاوەڵانی خۆی کۆی کردەوە و بەرەو رۆم بەرێکەوت. پاشای رۆم سوپایەکی بۆ شەڕی ئەو رەوانە کرد کە شکستیاندا و کوشتیان.

دوای ئەو ئێلریك هاتەسەر کار کە پیاوێکی بێدین و بوێر بو. ئەو بەرێکەوت تا تۆڵەی وەگدیش و کەسانێك بکاتەوە کە هاورێ لەگەڵ ئەو کوژرا بون. گەمارۆی خستە سەر رۆمیە و خەڵکەکەی خستە تەنگانەوە و بەزۆری شمشێر ڕۆشتە ناو ئەو شارە و سامانەکانی ئەوانی تالان کرد و چەندین کەشتی شەڕکەری کۆکردەوە و بەرەو دورگەی سیسیل بەرێکەوت تا دەستی بگرێت و تالانی بکات. زۆرینەی سوپاکەی لەناو دەریادا خنکان و خۆی لەناو ئەو کەسانەدا بو کە لەئاوەکەدا خنکان.

دوای ئەو ئەتلوف هاتە سەر کار وبۆ ماوەی سێ ساڵ پاشایەتی کرد و لەشاری ئیتالیە هاتەدەر و لەشاری گالیس لەدوری ئاندۆلۆس نیشتەجێ بو و لەوێوە بەرەو بەرشەلۆنە (بارسلۆن) بەرێکەوت.

دوای ئەو براکەی بۆ ماوەی سێ ساڵ، والیا، بوردزاریش سی و سێ ساڵ، کوڕەکەی ترشمەند، براکەی لەزریك سیانزە ساڵ، ئوریك حەفدە ساڵ، ئەلریك بەتلوشە بیست و سێ ساڵ، ئیشلیك، ئیملیك دو ساڵ، توزیۆش حەفدە ساڵ و پێنج مانگ، تودتکدلیس یەك ساڵ و سێ مانگ، ئەسلە پێنج ساڵ، ئەتلەنجە پانزە ساڵ، لیوبا سێ ساڵ و دواتر براکەی لویلد فەرمانڕەوایەتیان کرد. لویلد یەکەم کەس بو تولدۆی کردە پایتەختی خۆی و لەوێ نیشتەجێ بو تا لەناو ولاتەکەیدا بێت و بتوانێت لەگەڵ نەیاران شەڕ و سەرکوتیان بکات. بەردەوام لەگەڵ نەیاران شەڕی کرد تا دەستی بەسەر سەراسەری ئاندۆلۆسدا گرت و بناغەی شاری رکوبلی دانا و چەندین باغ و بێستانی گەورەی تیا دروست کرد. ئەم شارە لەتولدۆوە نزیك و بەناوی کوڕەکەیەوە ناوی نا. بۆ شەڕی خەڵکانی بشکنس بەرێکەوت و ئەوانی دەستەمۆ و ملکەچ کرد و لەکچی کوڕی پاشای فەرەنگ (ناوی کچەکە ئارمانگلیدا) خوازبێنی کرد و ئەوی کردە هاوسەری خۆی و لەئیشبیلە

نیشتەجێی کرد. ئەم کچە بۆ نافەرمانی کردن لەبەرابەر باوکی هانیدا و ئەو شۆڕشی دەست پێکرد. باوکی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە بو و گەمارۆی خستنەسەر و ڕۆژگاری لێ تاڵ کردن و بەزۆری شمشێری دەستی بەسەرداگرت و کوڕەکەی خستە زیندانەوە کە تاکۆتایی تەمەنی بەم شێوەیە گرفتار بو.

دوای لویلد کوڕەکەی ڕکرد بو بەپاشا کەپیاوێکی کردار جوان و قەشەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و گۆڕانکاری لەچۆنیەتی فەرمانڕەوایەتی باوکیدا کرد و وڵاتەکەی تەسلیمی ئەوان کرد کە نزیکەی هەشتا قەشە بون. ئەو پیاوێکی داوێن پاك و خۆپارێز بو و جل و بەرگی مەسیحیەکانی لەبەر دەکرد. بناغەی کەنیسەی ناسراو بەناوی (وزکە) یا کەنیسەی شاری (ئەلوزگە)ی لەبەرابەر شاری وادی ئاش دارشت. دوای خۆی کوڕەکەی لیوبا بەپاشایەتی گەیشت و شێوەی باوکی گرتەبەر. پیاوێك لەگوتیەکان بەناوی بسریك بەشێوەیەکی لەناکاو کوشتی و خۆی (بێ ڕەزامەندی خەڵکانی ئاندۆلۆس) لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. پیاوێکی ستەمکار و یاخی بو و لەبەر ئەمە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی دژی ئەو ڕاپەری و کوشتی.

دوای ئەو گندمار دوساڵ و سیسفوت بۆ ماوەی نۆ ساڵ پاشایەتیان کرد. ئەو پیاوێکی چاکەخواز و کردار پاك بو. دوای ئەو کوڕە سێ مانگەکەی هاتەسەر کار و مرد. دوای ئەوان شەنتلە بو بەفەرمانڕەوا کە پاشایەتیەکەی هاوکات بو لەگەڵ دەرکەوتنی پێغەمبەر(د.خ) و پیاوێکی پەسەند کراو بو. دوای ئەو سشنندە پێنج ساڵ، خەنتەلە شەش ساڵ، خەندس چوار ساڵ، بنیان هەشت ساڵ و ئەروی بۆ ماوەی حەوت ساڵ پاشایەتیان کرد.

لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەو وشکەساڵیەکی مەترسیدار رویدا کە ئەوەندەی نەمابو ئاندۆلۆس لەزیانی برسیەتی لەناو بچێت.

دوای ئەو کوڕەکەی ئابکە (پیاوێکی ستەمکار و سەرکۆنە کراو) و دواتر کوڕەکەی گیتشە پاشایەتیان کرد. فەرمانڕەوایی ئەو لەساڵی ٧٧ کۆچی/ ٦٩٦ زایینی دەستی پێکرد. پیاوێکی کردار پاك و نەرم و مێهرەبان بو و هەمو ئەو کەسانەی ئازاد کرد کەباوکی زیندانی کردبون و سامانی خەڵکانی بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە.

مرد و دو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت کەخەڵکانی ئاندۆلۆس بەپاشایەتی ئەو

دوانە رازی نەبون و کەسێکیان بەناوی رزریك کردە پاشا کەپیاوێکی بوێر بەڵام لەبنەماڵەی پاشاکان نەبو. شێوازی پاشاکانی ئاندۆلۆس ئەوە بو کە کوڕان و کچەکانی خۆیان بۆ تولدۆ دەنارد تا لەخزمەتی پاشادابن و تەنیا خزمەتی ئەو بکەن و بەم شێوەیە ببنە کەسێکی بیرمەند و فرەزان. کاتێك دەگەنە تەمەنی هاوسەرگیری، پاشا ئەوان دەکاتە هاوسەری یەك و مارەییان پێدەبەخشێت. کاتێك رزریك بەپاشایەتی گەیشت، بولیان پاشای دورگەی سەوز و سەبتە و کەسانیتر کچێکیان بۆ نارد کەپەسەندی کرد و مۆری کچێنی لێ هەڵگرت. کچ چۆنیەتی ئەم کارەی بۆ باوکی نوسی کەتوڕە بو و بۆ موسا کوڕی نوصەیر کارگوزاری عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەئەفریقیە نامەی نوسی و ملکەچی خۆی نیشاندا و داوای لێکرد بڕواتە ولاتەکەی ئەو. موسا بەرێکەوت و یولیان رۆشتە ناو شارەکانی ئەو و لەو بۆ خۆی و هاوەڵانی پەیمانە دڵخۆشکەرەکانی وەرگرت. دواتر وەسفی ئاندۆلۆسی بۆ کرد و بۆ رۆشتن بۆ ئەوێ هانیدا و ئەمە لەکۆتایی ساڵی نەوەد/ ئۆکتۆبەری ٧٠٩ زایینی رویدا.

موسا نامەی بۆ وەلید نوسی و ئاگاداری کردەوە کە خواوەند چ سەرکەوتنێکی پێ بەخشیوە و یولیان پێشنیاری چ کارێکی پێکردوە. وەلید بۆی نوسی: شەڕکەران کەم کەم و بارسوك بۆ ئەو دیارە رەوانە بکە و موسوڵمانان گرفتاری ئەو دەریا مەترسیدارە مەکە. موسا نوسی: دەریا نیە بەڵکو دورگەیەکە کەکۆتاییەکەی دیارە. وەلید نوسی: بەشەرکەرە بارسوکەکان تاقی بکەرەوە هەرچەندە ئەو دورگەیە بەو شێوەیە بێت کە تۆ دەڵێیت.

ئەو پیاوێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی تەریف هاورێ لەگەڵ چوارسەد پیاوی شەرکەر و سەد ئەسپ رەوانە کرد کەسوار چوار کەشتی بون کە گەشتنە دورگەیەك کەدواتر بەدورگەی تەریف ناوی دەرکرد چونکە ئەو پیاوە (تەریف) لەوێ دابەزی. دوای ئەوە هێرشیان کردە سەر دورگەی سەوز و سامانێکی زۆری تالان کرد و لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٩١/ ژوئیەی ٧١٠ تەندروست گەڕایەوە. کاتێك خەڵك ئەمەیان بینی، رویان لەگۆڕەپانەکان کرد.

دواتر موسا یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی تارق کوڕی زیاد کەفەرماندەی پێشەنگەکان بو، لەگەڵ حەوت هەزار پیاوی شەڕکەر لەموسوڵمانان (زۆرینەیان لەبەربەریەکان و موالیەکان و کەمینەیان لەعەرەبەکان) رەوانە کرد کەبەرەو دەریا

بەرێکەوتن و دوای ئەوە مەبەستی کێوێکی بەرزیان کرد و لەوێ دابەزین کە لەو ڕۆژەوە تا ئێستا بەناوی کێوی تارق (جبل طارق)ناو دەبرێت. کاتێك لەرۆژگاری دواتر عەبدئەلمۆمن لەم ناوچەیە بو بەپاشا، فەرمانیدا کە لەسەرەوەی ئەم کێوە شارێکیان دروست کرد و بەکێوی سەرکەوتن ناویان برد بەلآم ئەم ناوە زۆر نەمایەوە و خەڵك بەناوی یەکەم (جبل طارق)ناویان بردەوە.

هاتنی تارق بۆ ئەو شوێنە لەمانگی رەجەبی ساڵی ٩٢ کۆچی/ مارس – ئاوریلی ٧١١ زایینی بو. کاتێك تارق سوار کەشتی بو، خەوی لێکەوت. پێغەمبەری(د.خ) لەخەودا بینی کە لەگەڵ موهاجیرەکان و ئەنساردایە و ئەوان شمشێریان بەستوە و کەوانەکانیان کردۆتە مل. پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: ئەی تارق، بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەت هێرش ببە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدا لەگەڵ موسوڵمانەکان بەنەرمی و مێهرەبانی هەڵس و کەوت بکات. دواتر تارق سەیری کرد و بینی پێغەمبەر(د.خ) وهاوەڵانی ڕۆشتنە ناو ئاندۆلۆس و لەپێش خۆی و سوپاکەیەوە بەرێکەوتن. لەخەو هەستا و شادمان بو و مژدەی بەهاورێکانیدا و ورەی گرت و بێ گومان دەیزانی کەسەرکەوتن بەدەست دێنێت.

کاتێك سوپاکەی تارق گەشتنە کێوەکە، بەرەو دەشتەکە هاتەخوار و دەستی بەسەر دورگەی سەوزدا گرت و لەوێ پیرێژنێکی بینی. ژن پێی وت: من مێردێکم هەبو کەپێشهاتەکانی لەپێشەوە دەزانی و لەگەڵ خەڵك سەبارەت بەفەرماندەیەك قسەی دەکرد کەدێتە شارەکەی ئەوان و دەستی بەسەردا دەگرێت. بەم شێوەیە وەسفی دەکرد کە سەرێکی گەورەی هەیە و خاڵێکی ڕەش لەسەر شانی چەپیەتی کەمووی لێ رواوە. تارق جلەکانی لابرد و خاڵەکەی بەسەر شانی خۆیەوە بینی. جارێکیتر مژدەیان پێدا و هاورێکانی هەمو شادمان بون. لەکێوەکە هاتەخوار و دورگەی سەوز و شوێنەکانی دیکەی گرت و قەلآ کوێستانیەکەی بەجێهێشت.

## درێژەی گێڕانەوەی دەست بەسەردا گرتنی ئاندۆلۆس

کاتێك رزریکیان ئاگادار کردەوە کە تارق دەستی بەسەر وڵاتەکەیدا گرتوە، تورە بو و ئەم کارەی بەگەورە زانی. ئەو دور لەکاروباری وڵاتەکەی و سەرقاڵی شەرەکانی خۆی بو. لەو شەرە دەستی هەڵگرت و سوپایەکی کۆکردەوە کە دەڵێن ژمارەکەی دەگەیشتە سەد

هەزار کەس. کاتێك ئەم هەواڵە بەتارق گەیشت، نامەی بۆ موسا نوسی و داوای هاوکاری لێکرد و لەسەرکەوتنەکانی خۆی ئاگاداری کردەوە و پێی وت کە ئێستا پاشای ئاندۆلۆس بەسوپایەکی گەورە بۆ شەڕی ئەم خۆی ئامادە کردوە کەناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. موسا پێنج هەزار پیاوی شەڕکەری رەوانە کرد و ژمارەی موسوڵمانەکان بۆ دوانزە هەزار شەڕکەر زیادی کرد. یولیان هاورێیەتی موسوڵمانانی کرد و کاری سیخوڕی بۆ ئەوان ئەنجامدەدا و جێگە لاواز و زیان وەرگرەکانی وڵاتەکەی نیشانی سوپاکەی تارق دەدا. رزریك لەگەڵ سوپاکەی خۆی روبەری ئەوان بویەوە و لەکەنارەکانی روباری لەکە لەدەوروبەری شەزونە بۆ شەڕ ریزیان بەست و ئەمە دو رۆژی کۆتایی مانگی رەمەزانی ساڵی ٩٢/ ١٩ ژوئیەی ٧١١ زایینی رویدا. شەڕ هەشت رۆژی خایاند. فەرماندەی باڵی چەپ و راستی سوپاکەی دو کوڕەکەی پاشا و پێش ئەوان شازادەکانی دیکە بون. ئەوان رێککەوتن بۆ زیان گەیاندن بەرزریك لەگۆڕەپانی شەڕ هەڵبێن. بەیەکیان وت: کاتێك دەستی موسوڵمانەکان بەتاڵانیەکان پڕ ببێت، بۆ وڵاتەکەی خۆیان دەگەڕێنەوە و پاشایەتی بۆ خۆمان دەمێنێتەوە. ئەوان شکستیان خوارد و رزریك و سوپاکەی بەدوای ئەواندا. رزریك لەناوی روبارەکەدا خنکا و تارق تا شاری ئەستەجە شوێنیان کەوت. خەڵکەکەی هاورێ لەگەڵ شکست خواردوەکان کە ژمارەیان فراوان بو، روبەروی یەك بونەوە و شەرێکی قورسیان ئەزمون کرد. خەڵکانی ئاندۆلۆس شکستیان خوارد و دوای ئەوە موسوڵمانەکان گرفتاری شەرێکی ئەوتۆ نەبون. تارق لەسەر کانیەك دابەزی کە دوریەکەی تا شاری ئەستەجە چوار میلە و لەو کاتەوە بەکانیەکەی تارق ناوی دەبەن (عین طارق).

کاتێك گوتیەکان هەواڵی ئەم شکستەیان بیست، خواوەند ترسی خستە دڵیانەوە و گومانیان کرد کەئەویش وەك تەریف هەڵس و کەوت دەکات. تەریف بەشێوەیەك خۆی نیشانی ئەواندا بو کەخۆی و هاوەڵانی ئەوان دەخۆن. کاتێك رۆشتنە ناو تولدۆ و شارەکانی ئاندۆلۆسیان چۆڵ کرد، یولیان پێی وت: لەئاندۆلۆس تەواو بویت، ئێستا سوپاکەت بۆ هەمو سوچ و کەنارەکان رەوانە بکە و خۆت بەرەو کوردووا بەرێکەوە. ئەو سوپاکەی خۆی لەشاری ئەستەجەوە رەوانە کرد، سوپایەك بۆ کوردووا، سوپایەك بۆ گرەنادا، سوپایەك بۆ ماڵت، سوپایەك بۆ تەدمیر و خۆی لەگەڵ بەشی زۆری سوپاکەی بەرەو

ژیان بەرێکەوت تا لەوێوە بەرەو تولدۆ بڕوات. کاتێك گەشتە تولدۆ، شارەکەی بەچۆل بینی و زانی کە دانیشتوانەکەی بۆ شارێك لەو سەری کێوەکە بەناوی مایە کۆچیان کردوە.

ئەو سوپای کە بۆ کوردووا ڕۆشت، شوانێك ڕێگەی کەلێنی ناو دیواری شارەکەی نشیاندان کە شەڕکەران لەوێوە ڕۆشتنە ناو و گرتیان.

ئەو سوپایی کەڕۆشتە تەدمیر، ڕووبەڕوی پاشاکەیان تەدمیر( کە ناوی خۆی لەسەر شارەکە بو و پێش ئەو بە ئەرویلە ناودەبرا) بویەوە. تەدمیر سوپایەکی گەورە هاورێیەتی دەکرد. بەو پەڕی هێزەوە شەڕی لەگەڵ موسوڵمانان کرد و سەرئەنجام شکستی خوارد و خەڵکانێکی زۆر لەسوپاکەی کوژران. تەدمیر فەرمانی بەژنەکاندا کەرەستەی شەڕ هەلگرن، دواتر لەگەڵ موسوڵمانان لەسەر ئەو بنەمایە لەگەڵ موسوڵمانان ئاشتی کرد. سوپا ڕەوانە کراوەکانی دیکە دەستیان بەسەر ئەو ناوچانەدا گرت کە مەبەستی گرتنیان کردبو.

تارق، کاتێك بینی دانیشتوانی تولدۆ شارەکەیان چۆڵ کردوە، جولەکەکانی بۆ ئەو سەرزەمینە کۆچ پێکرد و خەڵکانێك لەهاوەلآنی خۆی پەیوەستی ئەوان کرد و خۆی بەرەو دۆلی بەرد بەرێکەوت و لەرێگەی کەلێنێکەوە بەناوی (کەلێنی تارق کە تا ئەمڕۆ بەو شێوەیە ناو دەبرێت) کێوەکەی بڕی و گەیشتە شارێك بەناوی (شاری خوان) و لەوێ خوانەکەی سلێمان کوڕی داوودی بینی کە کەنارەکانی لەبەردی سەوز و پایەکانی لەگەوهەر و مروارید و مەرجان و یاقوت و ... بو. شەست و هەشت پایەی هەبو. دواتر ڕۆشتە شاری مایە و تالآنی کرد و لەساڵی ٩٣/ ٧١٢ زایینی بۆ تولدۆ گەڕایەوە.

دەڵێن: تارق ڕۆشتە ناو سەرزەمینی گلیکیە تا بەشاری ئەسترکە گەیشت و دواتر بۆ گلیکیە گەڕایەوە. ئەو سوپایانەی کە لەشاری ئەستەجەوە ڕەوانەی کردبون، دوای گرتنی شارەکان لەگلیکیە پەیوەستی تارق بونەوە.

## شەڕەکانی موسا کوڕی نوصەیر

موسا کوڕی نوصەیر لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٩٣/ ژوئەنی ٧١٢ زایینی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان گەیشتە ئاندۆلۆس. لەکارەکانی تارق ئاگاداریان کردەوە و لەبەر ئەمە ڕژدی پێبرد. کاتێك لەڕوباری ئاندۆلۆس تێپەڕی و لەدورگەی سەوز دابەزی، پێی وترا:

ڕێگەی تارق بگرە بەر. ڕازی نەبو و ڕێنوماییکەرەکانی پێیان وت: تۆ بۆ ڕێگەیەکی باشتر و ئەو شارانەی دەستیان بەسەردا نەگیراوە، ڕێنوێنی دەکەین. یولیان مژدەی سەرکەوتنی گەورەی پێ بەخشی. موسا شادمان بو.

ئەویان بۆ شاری کوڕی سەلیم برد کەبەزۆری شمشێر دەستی بەسەردا گرت و دواتر بەرەو شاری کرمونە بەرێکەوت کە بەهێزترین قەڵای ئاندۆلۆس لەوێ جێگیر بو. یولیان و کەسانی تایبەت بەو ڕۆشتنە ناو شارە و وەك شکست خواردوەکان بەکەڵ و پەلی شەڕەوە ڕۆشتنە لای ئەوان. موسا سوارە شەڕکەرەکانی ڕەوانە کرد کەشەوانە دەستیان بەسەردا گرت و موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شارەکە. دواتر بەرەو ئەشبیلە (یەکێك لەگەورەترین و بەهێزترین شارەکانی ئاندۆلۆس) بەرێکەوت و بۆ ماوەی چەند مانگێك گەمارۆی خستەسەر و دەستی بەسەردا گرت. خەڵکەکەی هەڵاتن و موسا جولەکەکانی لەو شارەدا جێگیر کرد و بەرەو شاری ماردە بەرێکەوت و گەمارۆی خستە سەر. خەڵکەکەی ڕوبەڕویان بونەوە و شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. موسا لەشەودا شەڕکەرانی لەسەر ڕێگەکەی ئەوان جێگیر کرد کە ناباوەڕان ئەوانیان نەبینی. کاتێك بەیانی داهات، پێشڕەویان دەست پێکرد. ئەوان بەشێوازی ڕۆژانەی خۆیان ڕوبەڕوی موسوڵمانان بونەوە و موسوڵمانان لەسەر ڕێگەکەیان هێرشیان کردنەسەر و لە هەرچوار لاوە گەمارۆیاندان و لەنێوان ئەوان و شارەکە جیاییان دروست کرد و تا ئەو جێگەی توانیان ئەوانیان کوشتار کرد کەدەستەیەك ڕزگاریان بو و بۆ ناو شارەکە گەڕانەوە. شارەکە زۆر بەهێز بو. بۆ چەند مانگێك لەسەر گەمارۆدانی ئەوان بەردەوام بو و شەڕی لەگەڵ دەکردن. دواتر بەزرێ پۆشێك پێشڕەویان دەست پێکرد و دیواری شارەکەیان ڕوخاند. خەڵکەکەی ڕوبەڕوی موسوڵمانەکان بونەوە و لەبەردەم بورجەکەدا کوشتاریان کردن کە لەو ڕۆژەوە تا ئێستا بە بورجی گیانبەخشەکان بەناو بانگە. دواتر لەکۆتایی ڕەمەزانی ساڵی ٩٤ لەڕۆژی جەژنی ڕەمەزان/ ٣٠ ژوئەنی ٧١٣ زایینی دەستیان بەسەردا گرت و پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەستن لەسەر ئەو بنەمایی کە هەمو سامانی کوژراوەکانی ڕۆژی شەڕ لەسەر ڕێگاکان و سامانی هەڵاتوان بۆ گلیکیە و سامان و زێر و زیو و خشڵەکانی کەنیسەکان بۆ موسوڵمانان بێت.

دواتر خەڵکی ئشبیلیە کۆبونەوە و مەبەستی ئەو شارەیان کرد و موسوڵمانانیان لەو

شارەدا کوشتار کرد. موسا کوڕەکەی خۆی عەبدولعەزیزی بەسوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد کە بەزۆری شمشێر دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت و خەڵکەکەیان کوشتار کرد. لەوێوە بەرەو لەبلە و باژە بەرێکەوتن و ئەم دو ناوچەیان گرت و بۆ ئەیشبیلە گەڕانەوە.

موسا ڕۆشتە ساراگواسا و شارەکانی دەوروبەری و دەستی بەسەر هەمویاندا گرت و لەقولایی شارەکانی فەرەنگ پێشڕەوی کرد و گەیشتە دەشتێکی پان و بەرین کەچەندین شوێنەواری لێ بینرا. بتێکی گەورەی وەستاوی بینی کە ئەم وشانەیان لەسەر هەڵکەندبو: ئەی منداڵەکانی ئیسماعیل، کۆتایی ئێوە ئێرەیە، بگەڕێنەوە و ئەگەر پرسیان بۆ کوێ دەگەڕێنەوە، ئاگادارتان دەکەمەوە بۆ ناسازگاری لەناو خۆتانا دەگەڕێنەوە بەشێوەیەك شمشێرەکان لەناو خۆتاندا دەسورێنن و ملی یەکتر دەپەڕێنن و ئەمە کارێکە لەئێستاوە دەستتان پێکردوە.

گەڕایەوە و لەم کاتەدا نێردراوەکەی وەلید گەیشتە لای و فەرمانی پێدەدا لەئاندۆلۆس پاشەکشێ بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای وەلید. ئەم کارەی بەناخۆش زانی و ڕێگەی هەڵخەلەتاندنی نێردراوکەی گرتەبەر. دواتر بۆ سەرزەمینەکانی دوژمن لەشوێنێك بەناوی پانتایی بت ڕۆشتەدەر و کوشتاری کرد و ئەسیری گرت و کەنیسەکانی روخاند و ناقوسەکانی تێکشکاند تا گەیشتە سەر تاشەبەردی بەلای لەدەریایی سەوز و بەهەمان شێوە بەهێز و سەرفەراز بو. نێردراوێکی دیکە لەلایەن وەلیدەوە گەیشت و بەردەوام فەرمانی گەڕانەوەی پێدەدا. تەنانەت جڵەوی ئەسپەکەی گرت و رایکێشا. گەشتنی نێردراوەکەی دیکەی وەلید لەشاری گلیکیە بو. ئەو لەرێگەیەکی دور لەنێوان دو کێوی ناسراو بەناوی (شارێی موسا)وە هات و تارق لەسنورەکانی سەرەوە خۆی پێگەیاند و ئەوی لەگەڵ خۆی گەڕاندەوە و هەمویان پێکەوە گەڕانەوە.

موسا کوڕی خۆی عەبدولعەزیزی کردە جێگری خۆی لەئاندۆلۆس و کاتێك دەریایی بڕی و ڕوی کردە سەبتە، فەرمانڕەوایی ئەم شارە و تانژە و سنورەکانی دەوروبەری بە عەبدولمەلیکی کوڕی بەخشی. کورە گەورەکەی خۆی یانی عەبداللەی کردە فەرمانڕەوایی ئەفریقیە و خۆی بەرەو شام بەرێکەوت و ئەو سامانەی لەئاندۆلۆس بەدەستی هێنابو، هاورێ لەگەڵ پاشەکەوتەکان و خوانەکەی سلێمانی هەڵگرت و سی هەزار کچ لەشازادەکانی گوت و گەورەکانی ئەوان بۆ شامی برد. ئەوەندە گەوهەر و کاڵای

جۆراوجۆری بەدەست هێنابو کە نەدەخەملێنران. کاتێك گەیشتە شام کە وەلید کوڕی عەبدولەلیك مردبو و سلێمان کوڕی عەبدولەلیك کاروباری خەلافەتی گرتبوە دەست. ئەو موسای نەدەویست. ئەوی لەهەمو کارەکانی دورخستەوە و خستیە زیندان و قەرزێکی زۆری خستە ملی بەشێوەیەك ناچار بو داوای هاوکاری لەعەرەبەکان بکات.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك گەیشتە شام، وەلید زیندو بو. موسا نامەی بۆ وەلید نوسیبو و رایگەیاندبو کە خۆی دەستی بەسەر ئاندۆلۆسدا گرتوە. داستانی خوانەکەی سلێمان کوڕی داوودی بۆ نوسیبو. کاتێك گەیشتە لای ئەو، ئەوەی بەدەستی هێنابو نیشانیدا. تارق هاوڕێیەتی دەکرد. تارق وتی: ئەوە من بەدەستم هێناوە. موسا ئەوی بەدرۆزن ناوبرد. تارق پێی وت: سەبارەت بەپایە ونبوەکەی پرسیاری لێ بکە. وەلید ئەو پرسیارەی لێکرد بەلأم موسا ئاگادار نەبو. تارق دەریهێنا و نیشانیدا و وتی بۆ ئەم مەبەستە شاردبومەوە. وەلید زانی تارق راست دەکات. تارق بۆیە ئەو کارەی کرد چونکە پێشتر موسا لێیدا بو ونەوی خستبوە زیندان تا وەلید کەسی رەوانە کرد و ئازادی کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەوی زیندانی نەکرد.

دەڵێن: کاتێك رۆمیەکان گەیشتنە سەرزەمینی ئاندۆلۆس، لەپایتەختەکەیان خانوێکی لێبو کە هەر پاشایەك دەهاتە سەر کار، قوفڵێکی لێدەدا. کاتێك پاشایەتی کەوتە دەست گوتیەکان، درێژەیان بەم کارەی نەواندا و کاتێك رزریك بوبە پاشا، هەوڵیدا هەمو قوفڵەکان بکاتەوە بەلأم گەورەکانی شار رێگەی ئەم کارەیان لێگرت. ئەو ئامۆژگاریەکانی ئەوانی لەگوێ نەگرت و قوفڵەکانی کردەوە و لەناو ماڵەکە وێنەی عەرەبەکانی بینی کەدەستاری سوریان لەسەر وسوار ئەسپە سپی و خۆڵەمێشیەکان بون. نوسراوێکی لێ بو کەتیایدا هاتبو: کاتێك دەرگای ئەم ماڵە بکەنەوە، ئەم خەڵکە (عەرەبەکان) دێنە ناو ئەم شارە. ئاندۆلۆس لەو ساڵەدا دەستی بەسەرگیرا.

ئەم گێرانەوەیە سەبارەت بەگرتنی ئاندۆلۆس بەسە. پاشماوەی گێڕانەوەی گرتنی ئاندۆلۆس بۆ کاتی خۆی دوادەخەین کەبەخواستی خوای گەورە بەهەمان شێوە کە بەڵێنمان داوە، ئامازەی پێدەدەین.

## شەڕی دورگەی سەردانیە

ئەم دورگەیە لەدەریایی رۆم (دەریایی سپی ناوەڕاست) جێگیرە ویەکێك لەگەورەترین دورگەکان جگە لەدورگەی سیسیل و کرتە و میوەی فراوانی هەیە. کاتێك موسا دەستی بەسەر سەرزەمینەکانی ئاندۆلۆسدا گرت، دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بەرەو دەریا رەوانە کرد کە لەساڵی ٩٢/ ٧١١ زایینی گەیشتنە ئەم دورگەیە. لەم کاتەدا مەسیحیەکان دەفرە زێرین و زیوینەکانی خۆیان کۆکردەوە و خستیانە ناو لەنگەرگەکە و سامانەکانی خۆیان لەسەربانی پەرستگایەکی گەورە داشارد. موسوڵمانان لەم دورگەیە بەرادەیەك سامان و گەوهریان دەستکەوت کە نەدەخەمڵێنرا و نەدبژێردرا. تالآنی زۆریان لەسەر یەك کەڵەکە کرد. پیاوێك لەموسوڵمانان خۆی لەلەنگەرگەکەدا شۆرد و قاچی لەشتێك گیری کرد. دەریهێنا وبینی تەختەیەکی زیوینە. موسوڵمانەکان هەمو سامانەکانی ئەو سەرزەمینەیان کۆکردەوە. دواتر پیاوێك لەموسوڵمانەکان ڕۆشتە ناو کەنیسەکە وسەیری کۆترێکی کرد و تیرێکی بۆ هاویشت کە بەری نەکەوت و سەقفەکەی کون کرد و تەختەیەك شکا و شتێك هاوشێوەی دینار ڕژایە خوار. موسوڵمانەکان هاتن و هەمویان هەڵگرت و بەردەوام تالآنیەکانیان زیادی دەکرد. بەشێوەیەك هەندێ لەموسوڵمانەکان پشیلەیان سەردەبڕی و ناوسکیان پاك دەکردەوە و پڕیان دەکرد لەزێر و زیو و لەسەر رێگا دایان دەنان و لەکاتی ڕۆشتن هەڵیان دەگرتن. دەستەیەك کالآنی شمشێرەکانی خۆیان پڕدەکرد.

کاتێك سوار کەشتی بون، دەنگێکیان بیست کەدەیوت: ئەی خوایە، فریایی خنکاوان لەئاودا بکەوە. ئەوان تا دوایین کەسیان لەئاودا خنکان. زۆربەی خنکاوەکانیان بینی کە زێر و زیویان بەخۆیانەوە بەستوە.

لەساڵی ٧٥٣/١٣٥ زایینی عەبدولرەحمان کوڕی حەبیب کوڕی ئەبی عوبەیدەی فێهری بۆ شەڕ لەم دورگەیە بەرێکەوت و خەڵکەکەی کوشتار کرد. دواتر لەسەر بنەمای دانی باج پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەست و باج لەوان وەرگیرا و دوای ئەو کەس شەڕی لەو سەرزەمینە نەکرد و رۆمیەکان ئەو ناوچەیان ئاوەدان کردەوە.

کاتێك ساڵی ٣٢٣/ ٩٣٥ زایینی گەیشت، مەنصور کوڕی قایمی عەلەوی پاشای ئەفریقیە چەندین کەشتی شەرکەری لەمەهدیەوە رەوانە کرد کە شەڕکەرەکانی

لەجنوە(جینوا) تێپەڕین و دەستیان بەسەر ئەم شارەدا گرت و خەڵکی سەردانیەیان سەرکوت کرد و ئەسیریان گرت و چەندین کەشتیان سوتاند و شاری جینوایان خاپور کرد و هەمو سامانەکەیان تالآن کرد.

لەساڵی ٤٠٦/١٠١٦ زایینی موجاهیدی عامری لەدانیەوە بۆ شەڕ لەو شارە بەرێکەوت. پاشاکەی بەسەد و بیست کەشتی لەدەریادابو. موجاهید دەستی بەسەرداگرت و زۆرینەی پیاوەکانی کوشت و ژن و منالەکانی ئەسیر کرد. پاشای رۆم ئەمەی بیست و رۆمیەکان لەدەوری کۆبونەوە و لەرێگەی (وشکانی گەورەوە) بەسوپایەکی گەورە هێرشیان کردە سەریان کە موسوڵمانان شکستیان خوارد و لەدورگەی سەردانیە دەرپەڕێنران و دەستەیەك لەکەشتیەکانیان کەوتە دەست رۆمیەکان و براکەی موجاهید و کوڕەکەی عەلی کوڕی موجاهید ئەسیر کران. موجاهید لەگەڵ پاشماوەکان گەڕایەوە و دوای ئەو کەس شەڕی لەو دورگەیە نەکرد.

بۆیە هەمو گێرانەوەکانی تایبەت بەم دورگەیەمان لێرەدا ئاماژە پێدا چونکە کەم بون و ئەگەر لەشوێنە جیاوازەکان و ساڵە جیاوازەکان ئاماژەیان پێدەدرا، بەو شێوەی کەدەبێت بیرهێنانەوەیان ئاسان نەدەبو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و دەستی بەسەر سێ قەلآکەدا گرت و خەڵکی سوێسنەی بۆ سەرزەمینی رۆم کۆچ پێکرد. هەروەها لەم ساڵەدا قوتەیبە لەسیستان شەڕی کرد. دەستەیەك لەمێژوو نوسان ئاماژەیان بەم گێڕانەوەیە داوە. ئەو مەبەستی رۆتبیلی کرد و کاتێك لەسیستان دابەزی، رۆتبیل چەندین نێردراوی بۆ ئاشتی رەوانە کرد و قوتەیبە رازی بو و عەبدەریە کوڕی عەبداللەی لەیسی وەك فەرمانداری ئەوان دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد. کارگوزاری شارەکان هەمان کەسانی ساڵەکانی پێشتر بون.

لەم ساڵەدا مالك کوڕی ئەوس کوڕی حەدسانی بەسری لەبنەماڵەی نەصر کوڕی معاویە لە تەمەنی ٩٤ ساڵی لەمەدینە کۆچی دوایی کرد.

## روداوەکانی ساڵی نەوەد و سێی کۆچی ( ٧١٢ زایینی )

## ئاشتی خوارەزم شا و دەست بەسەردا گرتنی خام جەرد

لەم ساڵەدا قوتەیبە لەگەڵ خوارەزم شا ئاشتی کرد.

چۆنیەتیەکەی ئەوەی کە پاشای خوارەزم کەسێکی لاواز و ناتەوان بو و لەبەر ئەمە برا گەورەکەی خورەزاد بەسەریدا زاڵبو. کاتێك دەیبیست کەسێك لەپاشا نزیك بۆتەوە یا شتێك تایبەت بوە بەو، چ کەنیز چ سامان، ئەسپ، کچ یا خوشك یا ژنێکی جوان، کەسی رەوانە دەکرد و دەیگرت و کەس نەیدەتوانی رێگەی ئەم کارەی لێبگرێت و تەنانەت پاشاییش تواناى روبەروبونەوەی ئەوی نەبو، ئەگەر لەو کارانەی ئاگاداریان دەکردەوە، دەیوت: ناتوانم هیچ کارێك لەگەڵ ئەودا بکەم. بەلاّم پاشا لێی تورە بو.

کاتێك ئەم کارانەی بەردەوام بو، نامەی بۆ قوتەیبە نوسی و داوای لێکرد بڕواتە ناو وڵاتەکەی ئەو تا کاروبارەکان بەو بسپێرێت. پەیمانی بەست کە براکەی خۆی و هەرکەسێك لەگەڵ پاشایەتی ئەو ناسازگارە، تەسلیمی ئەو بکات تا بەو شێوەی کەدەخوازێت هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکات. قوتەیبە بەداواکەی رازی بو و هێزەکانی خۆی بۆ روبەرو بونەوە لەگەڵ دوژمن ئامادە کرد و واینیشاندا کەمەبەستی هێرش کردن سەر خەڵکانی سەغدی لەسەردایە. قوتەیبە لەشاری مەروە بەرێکەوت و خوارزەم شا کارگوزارەکانی خۆی کۆکردەوە وبەوانی وت: قوتەیبە دەیەوێت هێرش بکاتە سەر خەڵکانی سەغد و کاری بەئێوە نیە، با لەم بەهارە سەرسەوزەی خۆمان چێژ وەربگرین.

ئەوان دەستیان بەرابوردان وکات بەسەر بردن کرد و نەکەوتنە خۆ مەگەر ئەو کاتەی قوتەیبە لە هەزار ئەسپ دابەزی. خوارزەم شا بەهاوەڵانی خۆی وت: چی دەبینن؟ وتیان: دەبێت شەڕ بکەین. وتی: بەلاّم من شەر پەسەند ناکەم چونکە خەڵکانێکی بەهێزتر و بەشکۆتر لەئێمە لەبەرابەر ئەو چۆکیان داداوە، من شتێکی پێدەبەخشم و ناچاری دەکەم بگەرێتەوە. ئەوان رازی بون.

خوارەزم شا بەرێکەوت و لەشاری پیل کەبەهێزترین شاری سەرزەمینەکەی ئەو و لەوسەری ماوەرا ءئەلنەهر جێگیر بو، دابەزی، بەلاّم قوتەیبە لەروباری نەپەرِیەوە.

خوارەزم شا چەندین کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد و لەسەر بنەمای پێدانی دەهەزار سەر (مەڕومالآت) و زێڕ و زیوی فراوان ئاشتی لەگەڵ کرد بەو مەرجەی قوتەیبە لەبەرابەر خام جەرد هاوکاری بکات. قوتەیبە ڕازی بو.

دەستەیەك دەڵێن: لەسەر بنەمای پێدانی سەد هەزار سەر (مەڕومالآت) ئاشتی لەگەڵ کرد و دواتر قوتەیبە عەبدولڕەحمانی برای بۆ شەڕی خام جەرد ڕەوانە کرد کە سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ خوارەزم شا بو. عەبدولڕەحمان شەڕی لەگەڵ کرد و کوشتی و دەستی بەسەر سەرزەمینە پان و بەرینەکەی ئەودا گرت و چوار هەزار کەس لەوانی ئەسیر کرد و بۆ لای قوتەیبە ڕەوانەی کرد کە هەموویانی کوشت. قوتەیبە براکەی خوارەزم شا و ئەیارانی ڕادەستی ئەو کرد کەئەوانی کوشتار کرد و سامانی ئەوانی بۆ قوتەیبە ڕەوانە کرد.

## دەست بەسەردا گرتنی سەمەرقەند

کاتێك قوتەیبە ئاشتی خوارەزم شای بەدەست هێنا، موجەشەر کوڕی موزاحیمی سولەمی بەنهێنی پێی وت: ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژەکان مەبەستی خەڵکانی سەغد بکەیت، ئەو ڕۆژە ئێستایە چونکە ئەوان ئاسودەن و گومان ناکەن ئەم ساڵ کەس هێرش بکاتە سەریان. دوری تۆ لەوان تەنیا دەرۆژ ڕێگایە. قوتەیبە وتی: کەسێك ئەم کارەی بەتۆ پێشنیار کردوە؟ وتی: نە. وتی: کەس لەتۆی بیستوە؟ وتی: نە. وتی: ئەگەر کەسێك سەبارەت بەم نهێنیە یەك وشە بێنێتە سەرزمان، بێ گومان دەتکوژم.

کاتێك بەیانی داهات، فەرمانی بە عەبدولڕەحمانی برایدا لەگەڵ سوارکاران و تیرهاوێژەکان بەرێکەوێت و باروبنە پێش خۆی بخات تا دەیانباتە مەرو. ئەو ڕۆژە تا شەو ڕێگەی بڕی و کاتێك شەو داهات، قوتەیبە بۆی نوسی: کاتێك بەیانی داهات، باروبنە بۆ مەرو ڕەوانە بکە و خۆت لەگەڵ سوارەکان و تیرهاوێژەکان بەرەو سەغدیەکان بەرێکەوە و ئەم هەواڵە نهێنی بێت چونکە منیش بەدوای تۆدا بەرێدەکەوم. عەبدولڕەحمان فەرمانەکانی قوتەیبەی بەئەنجام گەیاند و قوتەیبە وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە و وتی: سەغدیەکان سەرقاڵ و گرفتاری کارەکانی خۆیانن و پەیمانەکەیان لەگەڵ ئێوە خستۆتە ژێرپێ و ئەو کارانەیان کردوە کەهەمموان لێی ئاگادارن. من هیوادارم خوارەزم و سەغد هاوشێوەی شەڕی بەنی قورەیزە و بەنی نەزیر (لەڕۆژگاری

پێغەمبەر(د.خ)) بێت. دواتر بەرێکەوت و سێ یا چوار رۆژ دوای عەبدولرەحمان گەیشت. خەڵکی بوخارا و خوارەزم لەگەڵ ئەودا بەرێکەوتن و یەك مانگ لەو کاتەوەی گەمارۆیان خستبوە سەرئەوان، شەڕیان لەگەڵ ئەوان کرد.

خەڵکانی سەغد بێزار بون چونکە گەمارۆەکەی سەریان درێژەی کێشا. لەبەر ئەمە نامەیان بۆ پاشای چین و ئێخشیدی فەرغانە نوسی: ئەگەر عەرەبەکان بەسەر ئێوەدا زاڵ ببن، ئەو بەلآیەتان بەسەر دێنن کە بەسەر ئێمەدا هێنایان. بەجوانی لەم کارە بڕوانن و هەمو هێزی خۆتان بخەنە گەڕ. ئەوان لێکۆڵینەوەیان کرد و وتیان: ئێمە لەژێردەستەکانی خۆمان زیانمان پێدەگات چونکە ئەوان وەك ئێمە پەرێشان نابن و ناشڵەژێن. ئەوان شازادەکان و شەڕکەران و پاسەوانانی سنورەکانی خۆیان کۆکردەوە فەرمانیان پێدان  بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەنە سەر لەشکرگەکەی قوتەیبە چونکە ئەو سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ خەڵکانی سەغدە و گەمارۆی خستۆتە سەر سەمەرقەند. ئەوان یەکێك لەکوڕەکانی خاقانیان کردە سەروەری خۆیان و بەرێکەوتن.

قوتەیبە لەم کارە ئاگادار بویەوە و لەسوپاکەی خۆی چوارسەد یا شەشسەد پیاوی بوێری هەڵبژارد و لەم هەواڵە ئاگاداری کردنەوە و فەرمانی پێدان بەرەو لای دوژمن بەرێکەون. ئەوان بەسەرکردایەتی ساڵح کوڕی موسلیم بەرێکەوتن و لەدو فەرسەخی لەشکرگەکەی ئەوان دابەزین. ساڵح دو دەستەی شەڕکەری لەسەر رێگەکەی ئەوان جێگیر کرد. کاتێك نیوەی شەو تێپەڕی، دوژمنان گەیشتن و کاتێك ساڵحیان بینی، هێرشیان کردەسەر و شەڕ دەستی پێکرد، دو دەستە شەڕکەرەکە لەچەپ و راستەوە لەشوێنی خۆحەشاردانیان هاتنەدەر. پیاوانی تێکۆشەرتر لەوان نەبینراوە. یەکێك لەوان وتی: سەرقاڵی شەڕ بوین کە لەژێر تاریکی شەو قوتەیبەم بینی کە بەنهێنی هاتبو و شەڕی دەکرد. شمشێرێکم وەشاند کە لەو کارە بەتەواوی دڵم خۆش بو. وتم: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، شێوەی شەڕی من چۆن دەبینیت؟ وتی: بێدەنگ بە، خوا دەمت بشکێنێت. دەڵێت: ئەوانمان کوشتار کرد و جگە لەهەلآتوان کەس لەوان رزگاری نەبو. ئێمە جل و بەرگ و کەل و پەلەکانی شەڕی ئەوانمان هەڵگرت و سەری ئەوانمان لەجەستە جیا کردەوە و چەندین کەسمان ئەسیر کرد. پرسیم کە: چ کەسانێکمان کوشت؟ وتیان: هەر کەسێك کەکوشتتان، شازادە و پاڵەوانەکانی ئەوان بون کەهەرکام

دەیتوانی روبەروی سەد پیاوی شەرکەر ببێتەوە. ناوی ئەوانمان لەسەر گوێچکەیان نوسی و کاتێك بەیانی بویەوە، گەڕاینەوە بۆ ناو لەشکرگەکەمان. نەبینرا هیچ کەسێك بەئەندازەی ئێمە کوژرا و ئەسیر و کەل و پەلی شەڕ و ئەسپ و پشتێنە زێرینەکانی کۆکردبێتەوە. دەڵێت: قوتەیبە رێزی لەمن و هاوەڵەکانم گرت. گومانم کرد ئەو لەو خەڵکە (سەغدیەکان) ئەو هەوڵ و تێکۆشانە دەبینێت کەمن بینیم.

کاتێك سەغدیەکان ئەمەیان بینی، ورەیان روخا و قوتەیبە کەشکەنجیرەکانی هەڵبەست و بەردبارانی کردن وکەلێنێکی گەورەی دروست کرد. لەو کەلێنەوە پیاوێکی بینی کە جوێنی بەقوتەیبە دەدا. یەکێك لەتیرهاوێژەکان تیرێکی بۆهاویشت و کوشتی. قوتەیبە دەهەزار درەمی پێ بەخشی. یەکێك لەموسوڵمانەکان قوتەیبەی بینی وەك بڵێی لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد و دەیوت: ئەی سەمەرقەند تاکەی دێو هێلانەکەی لەناو تۆدا دەبێت؟ سوێند بەخوا ئەگەر بەیانی دابێت، دورترین شوێنەکانی تۆ خاپور دەکەم. ئەو پیاوە گەڕایەوە و بەهاورێکانی خۆی وت: کەسانێکی زۆر بەیانی دەکوژرێن. ئەوانی لەبەسەرهاتەکەی قوتەیبە ئاگادار کردەوە. کاتێك بەیانی داهات، قوتەیبە فەرمانی بەخەڵکدا لەشەڕ زیاتر تێبکۆشن. ئەوان هەوڵیاندا و شەڕی روی لەدژواری کرد. قوتەیبە فەرمانی پێدان خۆیان بەکەلێنەکە بگەیێنن. ئەوان قەڵغانەکانی خۆیان بەرز کردەوە و هێرشیان کرد تا خۆیان گەیاندە کەلێنەکە و لەوێ وەستان. سەغدیەکان ئەوانیان زوبین باران کرد بەڵام عەرەبەکان پاشەکشێیان نەکرد. سەغدیەکان کەسیان بۆ لای قوتەیبە رەوانە کرد و وتیان: ئەمرۆ پاشەکشێ بکە و بەیانی لەگەڵ تۆ پەیمانی ئاشتی مۆر دەکەین. قوتەیبە وتی: ئاشتی ناکەین مەگەر ئەوەی کەلێنەکە لەبەردەستی سوپاکەی ئێمەدا بێت. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو قوتەیبە وتی: کۆیلەکان بێزاربون، بگەرێنەوە چونکە سەرکەوتن لەگەڵ ئێوەیە. ئەوان گەڕانەوە و قوتەیبە بەیانی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان مۆر کرد لەسەر ئەو بنەمای کە دوهەزار هەزار و دوسەد هەزار مسقاڵ زێر بدەن و ساڵانە سی هەزار سوارەی شەرکەر بۆ لای ئەو رەوانە بکەن و شارەکان چۆڵ و تەسلیمی قوتەیبەی بکەن بەشێوەیەك کە هیچ شەرکەرێکی تیا نەبێت تا دەرواتە ناو شارەکان و مزگەوتێك دروست بکات و لەو مزگەوتەدا نوێژ بخوێنێت و دواتر وتارێك پێشکەش بەخەڵکان بکات و نان بخوات و بگەرێتەوە.

کاتێك پەیمانی ئاشتی کۆتایی هات و ئەوان شاریان چۆڵ کرد و ئەمان مزگەوتەکەیان دروست کرد، قوتەیبە لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەری هەڵبژێردراوی خۆی ڕۆشتە ناو شار و مزگەوتەکە. نوێژی خوێند و وتارێکی پێشکەش کرد و نانی خوارد و دواتر پەیامی بۆ سەغدیەکان نارد: هەرکەس لەنێوە کەدەیەوێت کاڵاکانی خۆی هەڵبگرێت با بێت چونکە من لەم شارە ناڕۆمەدەر مەگەر تەنیا بەو شێوەی کە پەیمانم لەسەر بەستوە. هیچ شتێك وەرناگرم بەڵام سوپاکەم لەم شارەدا دەمێنێتەوە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو لە ئاشتی نامەکەدا ئەمەی نوسی کە دەبێت سەد هەزار سوارەی شەڕکەری پێ بدەن و ئاتەشکەدەکان بەو بسپێرن تا زێر و زیوەکانی تاڵان بکات و بتخانەکان تا سامانی ئەو شوێنانەیش هەڵبگرێت. ئەو هەمو سامانەکانی تاڵان کرد. بتەکانیان لای ئەو کۆکردەوە کە هاوشێوەی کۆشکێکی گەورە بون. هەمو بتەکانی روت کردەوە و دواتر فەرمانی سوتاندنی ئەوانی دەرکرد. غوزەك هاتە لای و وتی: سوپاس کردنی تۆ لەسەر من پێویستە، ئازاری بتەکان مەدە چونکە هەندێ بت لەناو ئەواندایە کە هەر کەس لەناویان ببات، لەناو دەچێت. قوتەیبە وتی: ئەوان بەدەستی خۆم لەناو دەبەم. ئاگری هەڵگرت و تەکبیری وت و ئەوانی سوتاند. لەناو خۆڵەمێشی بتەکان بزماریان دۆزیەوە کە کێشەکەی پەنجا هەزار مسقاڵ (٢٣٢٠٠٠ گرەم) بو.

ئەو لەسەغد کچێکی لەبنەماڵەی یەزدگێرد دەست کەوت و ئەوی بۆ لای حەجاج رەوانە کرد و حەجاجیش بۆ وەلیدی رەوانە کرد کە یەزید کوری وەلیدی بۆ هێنایە دونیا.

فەرمانی بەغوزەکدا لەو شارە کۆچ بکات و کۆچی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: خەڵکانی سەمەرقەند دژی موسوڵمانەکان راپەڕین و لەرۆژی جەژنی رەمەزان شەڕیان لەگەڵ کردن. لەو رۆژەدا قوتەیبە فەرمانیدا و تەختێکیان بۆ هێنا. تەختەکەیان لەسەر بەرزاییەك دانا و لەسەری دانیشت. ئەوان لەموسوڵمانەکانیان دەدا تا لەقوتەیبە تێپەڕین و ئەو بەهەمان شێوە شمشێر لەدەست دانیشتبو. دو باڵی سوپاکەی ئیسلام هێرشیان کردە سەر کەسانێك کە دڵی سوپای موسوڵمانانیان تێکشکاندبو. ئەوانیان شکستدا و بۆ ناو لەشکرگەکەیان پاشەکشێیان پێکردن و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی سەغدیان کوشتار کرد و عەرەبەکان ڕۆشتنە ناو شارەکە و

پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ بەستن. غوزەك خوراردنێکی ئامادە کرد و قوتەیبەی بانگێشت کرد. قوتەیبە لەگەڵ دەستەیەك لەهاورێکانی خۆی ڕۆشتە لای و کاتێك پاشا لێی جیابویەوە، داوای سەمەرقەندی لێکرد و بەپاشایی وت: لەم شارە کۆچ بکە. ئەو هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکەی نەبینی و قوتەیبە ئەم ئایەیی خوای گەورەی خوێندەوە: ئەو عادی یەکەمی بەرەو لەناوچون برد، و خەڵکانی سەمودی بۆ دڵی نەمان پەلکێش کرد و هیچ لەوان نەمایەوە (نجم/٥٣/٥٠-٥١).

لەو پیاوەی کە قوتەیبە بۆ گەیاندنی هەواڵی سەرکەوتنی سەمەرقەند بەحەجاج ڕەوانەی کردبو، داستانێك دەگێڕنەوە کەدەیوت: دوای ئەوە حەجاج منی بۆ لای وەلید ڕەوانە کرد. من لەکاتی بەرەبەیان گەیشتمە دیمەشق و ڕۆشتمە مزگەوت. پیاوێکی کوێر لای من بو. لەمنی پرسی: خەڵکی کوێیت؟ وتم: خوراسان. لەسەرکەوتنی سەمەرقەند ئاگادارم کردەوە. وتی: سوێند بەو کەسەی محەممەدی بەراستی و دروستی ڕەوانە کرد، تەنیا بەفرت و فێڵ دەستتان بەسەر ئەم شارەدا گرت! ئێوە ئەی خوراسانیەکان، ئەو کەسانەن کەپاشایەتی لەدەستی ئومەوییەکان دەردێنن و یەك یەکی خشتەکانی دیمەشق لە شوێنەکانیان هەڵدەکەنن. کاتێك قوتەیبە دەستی بەسەر سەمەرقەنددا گرت، وتیان: ئەمە بەهێزترین پیاوە کە دوو کەڵە کێوەی بەیەك تیر دەکوژێت. لەبەر ئەوەی چونکە ئەو لەیەك ساڵدا دەستی بەسەر سەمەرقەند و بوخارادا گرت. کاتێك سوارەیەك لەکاتی تیرهاویشتن دو کەڵەکێوی بەیەکەوە دەکوشت، دەیانوت: (عادی عیرین). کاتێك دەستی بەسەر سەمەرقەندا گرت، نەهار کوڕی تەوسعەی بانگ کرد و وتی: ئەی نەهار چی لێهات ئەوەی کەوتت:

الاذهب الغزو المقرب للغنی      و مات الندی و الجود بعد المهلب

اقاما بمرو الرود رهن ضریحه      و قد غیبا عن کل شرق و مغرب

یانی: شەڕی سودبەخش نەما و گەورەیی و ڕێزداری دوای موهەلیب مردن. ئەم دوانە لەمەرورود پەیوەستی ئارامگاکەی ئەو بون و لەرۆژهەلات و رۆژئاوا خۆیان شاردەوە.

ئایا ئەمە شەڕی سوودبەخش نیە؟ وتی: نا، لەو باشترە. من ئەو کەسەم کەدەڵێم:

و ما کان مذکنا و لا کان قبلنا      و لا هو فیما بعدنا کابن مسلم

اعم لاهل الشرك قتلا بسيفه          و اكثر فينا مقسما بعد مقسم

یانی: لەو کاتەوەی ئێمە بوین و لەو کاتەی پێش ئێمە و دوای ئێمە، پیاوێك هاوشێوەی قوتەیبە کوڕی موسلیم بونی نیە. هەمو بتپەرستەکانی کوشتار کرد و سات بەسات زێر و مەبەست خوازراوەکانی لەناو ئێمەدا دابەش دەکرد.

دەڵێت: شاعیرەکان لەمبارەوە شێعری زۆریان هۆنیەوە و لەناو ئەوان کومیت قەسیدەیەکی بو کە تیایدا دەیوت:

كانت سمرقند احيانا يمانية          فاليوم تنسبها قيسية مضر

یانی: سەمەرقەند بۆ رۆژگارێکی درێژ یەمانی بو بەلأم ئەمرۆ موزەریەکان بەقەیسی ناوی دەبەن.

کەعبی ئەشقەری یا پیاوێك لەجوعفی وتی:

كل يوم يحوى قتيبة نهبا          و يزيد الاموال مالا جديدا

باهلى قد البس التاج حتى          شاب منه مفارق كن سودا

دوخ الصغد بالكتائب حتى          ترك الصغد بالعراء قعودا

فوليد يبكى لفقد ابيه          و اب موجع يبكى الوليدا

یانی: هەر رۆژ قوتەیبە تالأنیەکی تازەی دەهێنایەوە و سامانێکی تازەی بەسامانەکان زیاد دەکرد. پیاوێکی باهلیە کە تاجی کردۆتە سەر و مووەکانی کەپێشتر رەش بون، لەشکۆی ئەو سپی بون. خەڵکانی سەغدی بەدەستە شەرکەرەکان سەرکوت کرد بەشێوەیەك لەناو بیابانە بێ کۆتاییەکان لەخاك و خوێنی خۆیاندا گەوزان. ئێستا ئەم خەڵکە لەدو دەستە بەدەر نین: منالێکی کەم تەمەن کە لەکوژرانی باوکی دەگریت و باوکێك کە بۆ کوژرانی گەنجەکەی خۆی فرمێسك لەچاوەکانی دەرژێنێت.

قوتەیبە بۆ مەرو گەڕایەوە. خوراسانیەکان دەیانوت: قوتەیبە فێڵی لەکاری خەڵکانی سەمەرقەند کرد و بەفریوکاری دەستی بەسەر ئەم شارەدا گرت.

کارگوزارکەی ئەو لەخوارەزم ئەیاس کوڕی عەبدالله بو کەفەرماندەیی کاروباری تایبەت بەشەری لەئەستۆدا بو بەلأم پیاوێکی ناتەوان و لاوازی لەخۆی نیشان دەدا. سەرپەرەستی باج کۆکردنەوە لەئەستۆی عوبەیدالله کوڕی ئەبی عوبەیدالله کۆیلەی موسلیمدا بو. خوارەزمیەکان ئەیاسیان بەناتەوان بینی و بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو کۆبونەوە.

عوبەیدالله نامەی بۆ قوتەیبە نوسی. قوتەیبە عەبداللەی برای وەك فەرماندەی ئەو سەرزەمینە دەستنیشان کرد و فەرمانی گرتنی ئەیاس و حەیانی نەبتی پێدا تا سەد قامچی لەهەرکامیان بدات و مووی سەر و روخساری ئەوان بتاشێت. کاتێك عەبدالله نزیك کەوتەوە، کەسی بۆ لای ئەیاس رەوانە کرد و ئاگاداری پێدا. ئەیاس لەخوارەزم دورکەوتەوە و عەبدالله هات و حەیانی گرت و سەروریشی تاشی.. دواتر قوتەیبە سوپایەکی بەسەرکردایەتی موغەیرە کوڕی عەبدالله رەوانە کرد. ئەم هەواڵە بەخوارەزمیەکان گەیشت و منداڵی ئەو کەسانەی بەدەستی خوارەزم شا کوژرا بون، لەشەڕ خۆیان بەدور گرت و وتیان: هاوکاریت ناکەین. ئەو بۆ سەرزەمینی تورکەکان هەڵات. موغەیرە هات و بەکوشتن و ئەسیر کردن سەرقاڵ بو و پاشماوەکان لەسەر دانی باج ئاشتیان لەگەڵ کرد. ئەو بۆ لای قوتەیبە گەڕایەوە کە فەرماندیی نەیشابوری پێبەخشی.

## گرتنی توڵدۆ لەئاندۆلۆس

ئەبو جەعفەری تەبەری دەڵێت: لەم ساڵەدا موسا کوڕی نوصەیر لەکۆیلەکەی تارق کوڕی زیاد توڕە بو و لەمانگی رەجەب/ ئاوریلی ٧١٢ زایینی بەرەو ئانۆدلۆس بەرێکەوت و کوڕەکەی عەبدالله کوڕی موسای وەك جێگری خۆی لەئەفریقیە دەستنیشان کرد. تارق پێشوازی لێکرد و رەزامەندی موسای بەدەست هێنا. موسا بەداوای لێخۆشبونەکەی رازی بوو و ئەوی بۆ توڵدۆ (تەڵیتەڵە) لەشارە گەورەکانی ئاندۆلۆس رەوانە کرد کە تا کردووا (قەرتەبە) بیست رۆژ رێگا بو. دەستی بەسەردا گرت و خوانەکەی سلێمانی دەستکەوت. ئەم خوانە لەگەوهەر و زێڕ بو. و خوا زاناترە.

دەڵێم: تەبەری شتێکی بەمە زیاد نەکردوە. من لەرووداوەکانی ساڵی ٩٢/ ٧١١ کۆچی سەبارەت بەگرتنی ئاندۆلۆس و هاتنی موسا کوڕی نوصەیر ئاماژەم بەچەندین بابەت دا کە پێویست ناکات لێرەدا دوبارەیان بکەمەوە. جگە لەوەی کە تەبەری وتویەتی ئەوە موسا بو( لەکاتی مانەوەی لەئاندۆلۆس) تارقی رەوانە کرد و تارق دەستی بەسەر شاری توڵدۆدا گرت. ئەوەی خەڵکی ئاندۆلۆس لەگێڕانەوەی مێژووی خۆیان ئاماژەی پێدەکەن ئەوەیە کە باسمان کرد.

## لەسەر کار لابردنی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەحیجاز

دەڵێن: لەم ساڵەدا وەلید عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەحیجاز و مەدینە لابرد.

هۆکارەکەی ئەوە بو کە عومەر نامەی بۆ وەلید نوسی و ئاگاداری کردەوە کە حەجاج ستەمکاری لەعێراق کردۆتە پیشە و نە لەروی راستی و دروستیەوە بەڵکو بەخراپە ئەوان سەرکوت دەکات. هەواڵی ئەم کارە بەحەجاج گەیشت و نامەی بۆ وەلید نوسی: ئەو دەستە لەهەڵگەڕاوەکان لەدین کە لای من بون، کۆچیان کرد و رویان کردۆتە مەککە و مەدینە. ئەمە دبێتە هۆکاری لاوازی ولآت و خەلافەتی تۆ. وەلید نامەی بۆ نوسی و راوێژی لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی کەسێك بۆ مەککە و مەدینە دەستنیشان بکات. ئەو خالید، عەبداللە و عوسمان کوڕی حەیانی پێ پێشنیار کرد. وەلید خالیدی کردە فەرمانداری مەککە و عوسمانی کردە فەرمانداری مەدینە. عومەری لەسەر کار لابرد.

کاتێك عومەر لەمەدینە هاتەدەر، وتی: دەترسم لەو خراپ کارانە بم کەمەدینە لەخۆی دوریان دەخاتەوە. مەبەستی وتارەکەی پێغەمبەر(د.خ) بو کەدەیفەرمو: مەدینە خراپەکاران لەخۆی دوردەخاتەوە.

لەسەر کار لابردنی ئەو لەمانگی شەعبان/ مەی ٧١٢ زایینی بو. کاتێك خالید گەیشتە مەککە، عێراقیەکانی لەو شارە دەرکرد و ئەو کەسانەی عێراقیەکانیان هێنابوە ماڵەکانی خۆیان یا خانویان بەوان بەکرێ دابو، ئاگاداری کردنەوە و ستەم و بێدادی لەسەر خەڵکانی مەککە گرتە پێشە و رێگەی جێ کردنەوەی عێراقیەکانی لێگرتن. لەرۆژگاری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بەشێوەیەك بو کەهەرکەس ترسی حەجاج دەکەوتە دڵیەوە، پەنای بۆ مەککە و مەدینە دەبرد.

دەستەیەك دەڵێن: وەلید عوسمان کوڕی حەیانی کردە فەرمانداری مەدینە. لەکاتی گێڕانەوەی روداوەکانی ساڵی ٩١/ ٧١٠ زایینی ئاماژەمان بەوەدا کەدەستەیەك ئاماژە بەدەستنیشان کردنی خالید لەمەککە دەکەن.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و دەستی بەسەر سنوری بانین و تەرسوس و سبستیەدا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا مەروان کوڕی وەلید بە مەبەستی شەڕ کردن گەیشتە خەنجەرە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەسلەمە بۆ شەڕ لەپانتاییەکانی رۆم بەرێکەوت و دەستی بەسەر ماسیسە و (قەلأیی ناسن) و غەزالە لەسنوری مالّت (مەلّیتە)دا گرت.

لەم ساڵەدا وشکە ساڵی لەئەفریقیە رویدا و موسا کوڕی نوصەیر نوێژی بارانی خوێند و باران باری.

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عەبدولەلیك نامەی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوسی (پێش لابردنی ئەو) و فەرمانی پێدا لەخوبەیب کوڕی عەبداللە کوڕی زوبەیر بدات و سەهۆلأوی بەسەردا بکات. عومەر پەنجا قامچی لێدا و لەزستاندا ئاوی ساردی پیاکرد و ئەوی لەمزگەوت دانیشاند کە لەهەمان رۆژدا مرد.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. فەرمانداری شارەکان ئەو کەسانە بون کە ناماژەمان پێدان جگە لەمەدینە کەفەرمانداریەکەی عوسمان کوڕی حەیان بو کە لەمانگی شوال دو رۆژ بۆ کۆتایی ئەو مانگە/ ٦ ئوتی ٧١٢ زایینی گەیشتە ئەو شارە. پێشتر ناماژەمان بەدەستنیشان کردنی خالید کوڕی عەبداللە لەمەککەدا لەساڵی ٨٩/ ٧٠٨ زایینی و ٩١/ ٧١٠ زایینی.

لەم ساڵەدا ئەبوئەل شەعسا عجابر کوڕی زەید و ئەبو ئەلعەتاهیە بورا ء(زیاد کوڕی فیروز) مردن. ئەمە جیاوازە لە ئەبو ئەلعەتاهیەی ریاحی کە لەساڵی ٩٠/ ٧٠٩ زایینی مرد. ئەبو ئەل عەتاهیەی یەکەم، کۆیلەی ژنێکی بیابانگەڕ لەبەنی ریاح بو. هەروەها لەم ساڵەدا بیلال کوڕی ئەبی دەردای ئەنساری دادیار لەدیمەشق کۆچی دوایی کرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی نەوەد و چواری کۆچی ( ٧١٣ زایینی )

## کوژرانی سەعید کوڕی جوبەیر

دەڵێن: لەم ساڵەدا سەعید کوڕی جوبەیر کوژرا.

هۆکاری کوژرانەکەی ڕاپەڕینی ئەو لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس بو. کاتێك حەجاج عەبدولرەحمانی بۆ شەڕی ڕۆتبیل ڕەوانە کردبوو، سەعید کوڕی جوبەیری کردبوە سەرپەرەستی دابەش کردنی تالآنیەکان لەناو سوپاکەی. کاتێك عەبدولرەحمان حەجاجی لەسەر کار لابرد، سەعید لەو کەسانە بو شوێنی کەوت. کاتێك عەبدولرەحمان شکستی خوارد وبۆ سەرزەمینی ڕۆتبیل هەڵات، سەعید روی لەئیسفەهان کرد. حەجاج نامەی بۆ کارگوزاری خۆی لەئیسفەهان نوسی و فەرمانی گرتنی سەعیدی پێدا. کارگوزار فەرمانەکەی جێبەجێ نەکرد و کەسی بۆ لای سەعید ڕەوانە کرد و ئاگاداری کردەوە تا لەو شارە بڕوات. ئەو لەو شارە هاتەدەر و ڕوی لەئازەربایەجان کرد و بۆ ڕۆژگارێکی درێژ لەوێ مایەوە و لەدرێژی ڕۆژگار بێزار و خەمبار بو. ڕۆشتە مەککە و لەوێ نیشتەجێ بو. کەسانی دیکەی هاوشێوەی ئەو دەبینران کە بەنهێنی ژیانیان بەسەر دەبرد و ناوی خۆیان بەکەس نەدەوت.

کاتێك خالید کوڕی عەبدالله بوبە فەرمانداری مەککە، بەسەعید وترا: پیاوێکی خراپەکارە، باشترە مەککە بەجێبێڵێت. وتی: ئەوەندە هەڵاتم کە لای خوا شەرمەزار بو و ئێستا دەزانم ئەوەی خوا بۆ چارەنوسی منی داناوە، ڕۆژێك ڕوبەڕوم دبێتەوە. کاتێك خالید گەیشتە کوفە، وەلید نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا عێراقیەکان بۆ لای حەجاج ڕەوانە بکات. ئەو سەعید کوڕی جوبەیر و موجاهید و تەڵەق کوڕی حەبیبی گرت و ڕەوانەی کرد. تەڵەق لەڕێگا مرد و موجاهید کەوتە زیندان و مایەوە تا حەجاج مرد.

ئەوانی لەگەڵ دو پاسەوان ڕەوانە کرد. یەکیان بۆ کارێك ڕۆشت و ئەوی دیکەیان مایەوە. بەسەعیدی وت کە لەخەو هەستابو: ئەی سەعید من لەخوێنی تۆ سوێند بەخوا تەنیا پاکی دەبینم چونکە لەخەودا بینیم کە بەمن وترا: هاوار لەتۆ! خۆت لەخوێنی سەعید ڕزگار بکە! ئێستا بۆ هەر شوێنێك دەخوازیت بڕۆ و دڵنیابە من بەشوێن تۆدا

ناگەرێم. سەعید رازی نەبو. ئەو پاسەوانە سێ جار ئەو خەوەی بینی و سێ جار پێشنیاری هەڵاتنی بەسەعید کرد و سەعید هەر سێ جارەکە رازی نەبو.

ئەویان بردە کوفە و لەماڵێکدا جێگەیان کردەوە و قورئان خوێنەکان هاتوچۆیان بۆ لای ئەو دەست پێکرد. لەگەڵ ئەوان قسەی دەکرد و بەشادمانیەوە پێدەکەنی و کچە بچوکەکەی لەسەر داوێنی بو. کاتێك سەیری زنجیر و بەندی پێی کرد، دەستی بەگریان کرد. ئەویان بردە لای حەجاج. کاتێك بردیانە لای حەجاج، وتی: نفرینی خوا لەزادەی ژنی مەسیحی (یانی خالید). خالید ئەوی رەوانە کردبو. درێژەی بەقسەکانی خۆیدا: ئایا پێگەی ئەوم لەمەککە نەدەپاراست؟ بەڵێ، سوێند بەو ماڵەی لەمەککەیە. دواتر روی کردە سەعید و وتی: ئەی سەعید! ئایا تۆم لەئەمانەتەکەی خۆم نەکردە شەریك؟ نەمکرد؟ ئایا تۆ بۆ کاروبارەکان دەستنیشان نەکرد؟ وتی: بەڵێ. حەجاج وتی: چ هۆکارێك بۆ راپەڕین دژی من هانیدایت؟ سەعید وتی: من پیاوێك لەموسوڵمانانم، هەندێ کات بەرێگەی راستدا دەڕۆم و هەندێ کات بەرێگەی هەڵە. حەجاج کەمێك ئارام بویەوە. دواتر درێژەی بەگفتوگۆکەدا و بابەتێکی دیکەی هێنایە گۆڕ. سەعید وتی: بەیعەتێك لەئەستۆی مندا بو. حەجاج توڕە بو و وتی: ئەی سەعید، مەگەر من نەڕۆشتمە مەککە و کوڕی زوبەیرم کوشت و بەیعەتم لەخەڵکەکەی و تۆ بۆ سەروەری باوەڕداران وەرگرت؟ وتی: بەڵێ. حەجاج وتی: مەگەر وەك فەرماندار نەهاتمە ناو کوفە و بەیعەتەکەم تازە کردەوە و بۆ جاری دوەم لەتۆ بەیعەتم بۆ سەروەری باوەڕداران وەرگرت؟ وتی: بەڵێ. حەجاج وتی: کەواتە تۆ دو جار بەیعەتی سەروەری باوەڕدارانت خستۆتە ژێرپێ و بەبەیعەتێك بۆ جۆلای لەجۆلابو ئەمەکدار مایتەوە! سوێند بەخوا تۆ دەکوژم! سەعید وتی: من بەختەوەرم بەهەمان شێوە کە دایکم بەو ناوە بانگی کردم. حەجاج فەرمانیدا و سەریان بڕی. سەری سەعید بەسەر زەویدا دەسوڕایەوە و داتر ئارامی گرت و کڵاوێکی خڕی سپی بەقوماشێکی ناسکی وردی ڕەشی لەسەردابو. کاتێك سەری کەوتە سەرزەوی، لێوەکانی بۆ دوجار سوپاسی خوایان کرد، جارێك بەدەنگی بەرز و جارێك بەهێواشی.

کاتێك سەعید کوژرا، ئاوزی حەجاج پەرێشان بو. بەردەوام دەیوت: زنیجرەکانی ئێمە لەپێی سەعید بکەنەوە. هەرکاتێك دەخەوت، سەعیدی لەخەودا دەبینی کەداوێنی

جلەکانی دەگرت و هاواری دەکرد: ئەی دوژمنی خوا! بۆ منت کوشت؟ حەجاج هاواری دەکرد: من کارم بەسەعید چی بو! سەعید چ خراپەیەکی لەگەڵ من کرد! بۆ ئەوم کوشت.

## شەڕی چاچ و فەرغانە

لەم ساڵەدا قوتەیبە لەروبار تێپەڕی و لەسەر خەڵکانی بوخارا و کێش و نەسەف و خوارەزم کۆکردنەوەی بیست هەزار شەڕکەری کردە فەرمانێکی پێویست. شەڕکەران لەدەوری کۆبونەوە و قوتەیبە ئەوانی بۆ چاچ رەوانە کرد و خۆی رێگەی فەرغانەی گرتەبەر و ڕۆشتە ناو خجندە. خەڵکان لەبەرابەر ئەو ریزیان بەست و چەندین جار شەڕیان تاقی کردەوە. لەهەمو شەڕەکاندا موسوڵمانان سەردەکەوتن. دواتر قوتەیبە بەرەو کاشان پایتەختی فەرغانە بەرێکەوت و ئەو سوپایەی بەرەو چاچ رەوانە ببو، پەیوەستی بون. ئەوان دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت و زۆربەیان سوتاند. قوتەیبە بۆ مەرو گەڕایەوە. سەحبان سەبارەت بەشەڕەکەی ئەوان لەخجندە وتی:

| | |
|---|---|
| فسل الفوارس فی خجـ | ـــندة تحت مرهفة العوالی |
| هل کنت اجمعهم اذا | هزموا و اقدم فی القتال |
| ام کنت اضرب هامة الـ | ـعاتی و اصبر للعوالی |
| هذا و انت قریع قیـــ | ـس کلها ضخم النوال |
| و فضلت قیسا فی الندی | و ابوك فی الحجج الخوالی |
| و لقد تبین عدل حکـــ | ـفیهم فی کل حال |
| تمت مروءتکم و نا | غی عزکم غلب الجبال |

یانی: لەو سوارکارانە بپرسە کە لە شەڕی خجندە لەژێر سێبەری ڕمەکان چی رویدا و چی پێشهات. ئایا مەگەر بەو شێوە نەبو کەکاتێك هەڵاتن، ئەوانم کۆکردەوە و بەرەو گۆڕەپانی شەڕ پێشڕەویم کرد؟ یا گەردنی یاخیانم دەپەڕاند و لەبەرابەر لێدانی ڕمە گیان ستێنەکان خۆڕاگریم دەکرد. ئەمە دەزانی و تۆ هاوخەباتی قەیسیەکانیت چونکە بەخششەکانیان فراوانن. تۆ و باوکت لەرۆژگارانی رابردو لەبەخشش پێش خەڵکانی قەیس کەوتنەوە. دادپەروەری داوەری تۆ لەهەر کێشەیەك ئاشکرا بو و جوامێری ئێوە گەشتە بەرزترین ترۆپك و رێزداری ئێوە بەرزایی کوێستانەکانی تێپەڕاند.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و دەستی بەسەر ئەنتاکیەدا گرت. هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولعەزیز بۆ شەڕ بەرێکەوت و گەیشتە غەزالە و وەلید کوڕی هوشامی موعیتی بۆ بورجی حەمام پێشڕەوی کرد و یەزید کوڕی ئەبی کەبشە تا قولایی سوریيە ئەسپی غاردا.

لەم ساڵەدا چەندین ئەردهەژێن لەشام رویدا کە چل رۆژ بەردەوام بو و شارەکانی وێران کرد. زۆربەی ئەرد هەژێنەکان لەئەنتاکیە رویاندا.

هەروەها لەم ساڵەدا قاسم کوڕی محەممەدی سەقەفی دەستی بەسەر سەرزەمینی هینددا گرت.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەلی کوڕی حسین (ئیمامی چوارەمی شیعەکان) لەسەرەتایی ئەم ساڵە، عوروە کوڕی زوبەیر، سەعید کوڕی موسەییب وئەبوبەکر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هشام.

وەلید، سلێمان کوڕی حەبیبی وەك سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی شام دەستنیشان کرد و مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد. دەستەیەك دەڵێن: عەبدولعەزیز کوڕی وەلید کوڕی عەبدولەلیك ئاییني حەجی ئەنجامدا. کارگوزاری مەککە خالید کوڕی عەبداللە، کارگوزاری مەدینە عوسمان کوڕی حەیان، کارگوزاری میسر قورە کوڕی شەریك و کارگوزاری خوراسان قوتەیبە بو.

## روداوەکانی ساڵی نەوەد و پێنجی کۆچی ( ٧١٤ زایینی )

## شەڕی چاچ

دەڵێن: لەم ساڵەدا حەجاج سوپایەکی لەعێراقەوە بۆ هاوکاری قوتەیبە رەوانە کرد کە بەهێزی ئەو درێژەی بەشەڕەکانیدا. کاتێك بەچاچ یا کەشماهان گەیشت، لەمەرگی حەجاج لەمانگی شوال، ژوئەنی ٧١٤ زایینی ئاگادار بویەوە و خەمبار و لەدڵتەنگی خۆی ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

لعمری لنعم المرء من آل جعفر        بحوران امسی اعقلته الحبائل

فان تحی لا املل حیاتی و ان تمت     فما فی حیاة بعد موتك طائل

یانی: سوێند بەگیانی خۆم پیاوێکی چاکەکار بو ئەو کەسەی لەبنەماڵەی جەعفەر لەدایك بو و لەسەرزەمینی حوران لەجل و بەرگی مەرگیانەوە ئاڵاند. ئەگەر زیندو بمێنیت، لەژیان بێزار نابم و ئەگەر بمریت، ژیان دوای تۆ هیچ سودێکی نیە.

ئەو بۆ مەرو گەڕایەوە و خەڵکان بڵاوەیان لێکرد و نامەی وەلیدی پێگەیشت بەم شێوەیە: سەرومەری باوەڕداران لەئەزمونی چاکەی تۆ و هەوڵ و تێکۆشانی تۆ بۆ شەڕ دژی خراپەکاران لێکۆڵینەوەی کرد. سەرومەری باوەڕداران پێگەی تۆ بەرز دەکاتەوە و ئەو کارە لەگەڵ تۆ دەکات کە شیاوی بۆی. درێژە بەشەڕەکانی خۆت بدە و لەخوا بپارێرەوە و بەردەوام نامەکانی خۆت بۆ سەرومەری باوەڕداران بنێرە تا بەو شێوەیە بێت وەك بڵێی من لەنزیکەوە سەیری کارەکانی تۆ دەکەم و چاودێری ئەو سنورانە دەکەم کەدەستیان بەسەردا دەگریت.

## مردنی حەجاج کوڕی یوسف

دەڵێن: لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ئاماژەیان بەستەمکاری حەجاج و کارگوزارەکانی سەردەمی وەلید دا. وتی: حەجاج لەعێراق، وەلید لەشام، قورە لەمیسر، عوسمان لەمەدینە، خالید لەمەککە! ئەی خوا هەمو جیهان لێوانلێو بو لەستەمکاری، خەڵکەکەت رزگار بکە! ئەوەندەی نەخایاند حەجاج کوڕی یوسف و قورە کوڕی شەریك

لەیەك مانگدا مردن. وەلید دوا بەدوای ئەوان مرد و عوسمان و خالید لەسەر کار لابران و خواوەند وەڵامی داواکەی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی دایەوە.

ئەمە داستانە هاوشێوەی داستانەکەی عەبدالله کوڕی عومەر لەگەڵ زیاد کوڕی ئوبیەیە چونکە ئەو نامەی بۆ معاویە نوسی: کاروبارەکانی عێراق بەدەستی چەپی خۆم هەڵدەسورێنم و دەستی راستم بێکارە. دەیویست حیجاز پەیوەستی فەرمانڕەوایەتی ئەو بکات. کاتێك ئەم هەواڵە بە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت، وتی: ئەی خوایە، ئێمە لەدەستی راستی زیاد بپارێزە و عێراقیەکان لەدەستی چەپی. یەکەم هەواڵ کە دوای ئەو پاڕانەوەیە بە کوڕی عومەر گەیشت، هەواڵی مردنی زیاد بو.

مردنی ئەو لەشواڵی ساڵی ٩٥/ ژوئەنی ٧١٤ زایینی بو. دەستەیەك دەڵێن: پێنج رۆژ بۆ کۆتایی رەمەزان/ ١٣ ژوئەنی ٧١٤ زایینی لەتەمەنی ٥٤ یا ٥٣ ساڵی ماڵئاوایی لەجیهان کرد و ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو لەعێراق بیست ساڵی خایاند. کاتێك وادەی مەرگی گەیشت، بۆ نوێژ کردن کوڕەکەی عەبدالله کوڕی حەجاج، بۆ شەڕی کوفە و بەسرە یەزید کوڕی ئەبی کەبشە و بۆ باج کۆکردنەوە یەزید کوڕی ئەبی موسلیمی دەستنیشان کرد. وەلید دوای مەرگی حەجاج پێگەی ئەوانی بەهێز کرد و هیچ کام لەکارگوزارەکانی حەجاجی نەگۆڕی.

## نەژاد و کرداری حەجاج

نەژادی بەمشێوەیە: باوکی محەممەد حەجاج کوڕی یوسف کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی عەقیل کوڕی عامر کوڕی مەسعود کوڕی موعتەب کوڕی مالك کوڕی کەعب کوڕی عەمرۆ کوڕی سەعد کوڕی عەوف کوڕی سەقیفی سەقەفی.

قوتەیبە کوڕی موسلیم دەڵێت: حەجاج وتارێکی بۆ ئێمە خوێندەوە و کەوتە بیری گۆڕستان. بەردەوام دەیوت: ماڵی تەنیاییە، ماڵی بێ کەسیە، ماڵی بێ ئاشنایی، ماڵی ئەوەیە، ماڵی ئەمەیە..... ئەوەندەی وت و گریا و خەڵکانی گریاند. دواتر وتی: لەسەروەری باوەڕداران عەبدولەلیکم بیست کەدەیوت: لەکاتی قسە کردن لەمەروانم بیست کەدەیوت: عوسمان قسەی بۆ ئێمە کرد و وتی: هەرگیز پێغەمبەر سەیری گۆڕێکی نەکرد یا ئاماژەی بەگۆڕێك نەدا مەگەر ئەوەی دەستی بەگریان کرد. لەمبارەوە حەدیسی جیاوازی دیکە لە کوڕی عەباس و ئەنس ئاماژەیان پێدراوە..

کوڕی عەوف دەڵێت: هەرجار کەگوێم لەقورئان خوێندنی حەجاج دەبو، بیرم دەکەوتەوە کە ئەو بۆ رۆژگارێکی درێژ لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوە. ئەبو عەمرۆ کوڕی عەلا ءدەڵێت: کەسم زمان شیرینتر لەحەجاج و حەسەن نەبینی بەلاّم حەسەن زمان شیرینتر بو. عەبدولەلیك کوڕی عومەیر دەڵێت: رۆژێك حەجاج وتی: کەسێك کە لەخزمەتی ئومەوییەکان ئەزمونی باشی هەبێت، هەستێت تا زێر و زیوی پێ ببەخشین. پیاوێك هەستا و وتی: من ئەزمونی باشم هەیە زێر و زیوم پێ ببەخشە. حەجاج وتی: چ ئەزمونێك؟ پیاو وتی: من حسین کوڕی عەلیم کوشت. وتی: چۆن کوشتت؟ وتی: جەستەی ئەوم بەرم کون کون کرد و بەشمشێر لەت لەت و لەکوشتنی ئەو کەسم نەکردە شەریکی خۆم. حەجاج وتی: تۆ لەگەڵ ئەو لەیەك شوێندا کۆنابنەوە، ون بە! هیچی پێنەدا.

دەڵێن: عەبدولەلیك نامەی بۆ حەجاج نوسی و فەرمانی پێدا ئەسلەم کوڕی عەبدی بەکری بکوژێت. هەواڵێکی ناخۆشیان لەو بە وەلید دابو. حەجاج بانگی کرد. ئەسلەم وتی: سەروەری باوەڕداران لێرە نیە بەلاّم تۆ هەیت. خوای گەورە دەفەرمێت: ئەی باوەڕداران، کاتێك خراپەکارێك هەواڵێك بۆ ئێوە دێنێت، بەجوانی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن (کەراست دەکات یا دۆ) ئاگادار بن لەروی ئەزانیەوە زیان لەکەس نەدەن و دواتر لەوەی ئەنجامتان داوە، پەشیمان ببنەوە (حجرات/٤٩/٦). ئەوەی لەمنەوە گێڕاویانەتەوە، هەڵیت و پڵیتە. نامە بۆ سەروەری باوەڕداران بنێرە کە من نانی بیست و چوار ژن دەدەم. ئەوانی بانگ کرد. دایکی بو، پوری، ژنەکەی، کچەکەی...... و لەکۆتایی هەمویان کچێکی دەساڵ. پێی وت: تۆ چی ئەسلەمیت؟ وتی: سەروەرمان بەختەوەر بێت، کچی ئەوم. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

احجاج لم تشهد مقام بناته      و عماته يندبنه الليل اجمعا

احجاج لم تقبل به ان قتلته      ثمانا و عشرا و اثنين و اربعا

احجاج من هذا يقوم مقامه      علينا فمهلا ان تزدنا تضعضعا

احجاج اما ان تجود بنعمة      علينا و اما ان تقتلنا معا

یانی: ئەی حەجاج، یا شایەتی ئەو دیمەنە نەبیت کە کچەکان و پورەکانی ئەو سەراسەری شەو بەشین و رۆڕۆ بەسەر ببەن. ئەی حەجاج، ئەوە پەسەند مەکە بیکوژیت

و هەشت کەس و دە و دو و چوار کەس پرسەگێر بکەیت. ئەی حەجاج، چ کەسێکە جێگەی خاڵی ئەو بۆ ئێمە پڕدەکاتەوە؟ کەمێك چاوەڕێ بە و ئێمە لەوەی کەههێن، لاوزاتر و هەژارتر مەکە. ئەی حەجاج، بەگەورەیی خۆت بیبەخشە یا هەمومان بەزیندویی بهێڵەرەوە یا هەمومان لەگەڵ ئەو بکوژە.

حەجاج گریا و وتی: سوێند بەخوا هەرگیز ڕۆژگاری ئێوە ڕەش و لەوەی کەههەن پەرێشانترتان ناکەم.

نامەی بۆ عەبدولەلیك نوسی و لەبەسەرهاتی ئەو پیاوە و هۆنراوەی ئەو کچە ئاگاداری کردەوە. عەبدولەلیك نوسی: ئەگەر بەو شێوەیە کەباسی دەکەیت چاکەی لەگەڵ بکە و دڵنەوایی ئەو کچە بدەرەوە. حەجاج ئەو کارەی کرد.

عاصم کوڕی بەهدەلە دەڵێت: لەحەجاجم بیست کەدەیوت: تا ئەو جێگەی دەتوانن، لەخوا بترسن. ئەمە ئایەیە، ببیستن و فەرمان ببەن و لەڕێگەی خوادا خەرج بکەن کە بۆتان باشترە. ئەمە ئایە نیە. سوێند بەخوا ئەگەر فەرمانتان پێبدەم لەم دەرگاوە بڕۆنە دەر و ئێوە لەو دەرگاوە بڕۆنەدەر (بەپێی ئایینی ئیسلام) ڕشتنی خوێنتان بۆ من ڕەوایە. نەبینم کەس بەپێی ڕێنوێنیەکانی کوڕی دایکی عەبد (یانی عەبداللە کوڕی مەسعود) قورئان بخوێنێت چونکە دەیکوژم. سوێند بەخوا ئەوە لەقورئان دەسڕمەوە، ئەگەر بەئێسقانی ورچیش بێت. ئەمەیان بۆ ئەعمەش گێڕایەوە و من بیستم. وتی: سوێند بەخوا بەکوێرایی چاوی تۆ بەو شێوەیە قورئان دەخوێنم.

ئەوزاعی دەڵێت: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز وتی: ئەگەر هەمو نەتەوەکان خراپەکارانی خۆیان کۆبکەنەوە و ئێمە بەتەنیا حەجاج بەرین، بەسەر هەموياندا زاڵ دەبێت. مەنصور دەڵێت: لەئیبراهیم شوجاعی سەبارەت بە حەجاج پرسیارم کرد. وتی: مەگەر خوا نەیفەرموە: نفرینی خوا لەستەمکاران بێت (هود/١١/١٨). شافعی دەڵێت: بۆ منیان گێڕایەوە کەجارێك عەبدولەلیك کوڕی مەروان بەحەجاجی وت: هیچ کەس نیە مەگەر ئەوەی لەکەم و کووڕیەکانی خۆی ئاگادارە. ئاماژە بەکەم و کوڕیەکانی خۆت بدە و هیچیان مەشارەوە. حەجاج وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، من پیاوێکی سەرسەخت و ڕقاوی و کینە لەدڵم. عەبدولەلیك پێی وت: کەواتە تۆ لەگەڵ شەیتان خزمیت. حەجاج وتی: ئەگەر شەیتان من ببینێت، ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ من دەگرێتەبەر.

حەسەن دەڵێت: لەعەلیم بیست کە لە سەرتەختی وتاردان وتی: خوایە، من ئەوانم ناسودە کرد و ئەوان منیان ترساند، چاکەی ئەوانم ویست و ئەوان فرت و فێڵیان کرد. ئەی خوایە پیاوێکی سەقەفی بکەرە فەرمانڕەوای ئەوان تا لەسەر بنەمایی ئایینەکانی رۆژگاری جاهلی فەرمانڕەوایەتی خوێن و سامانی ئەوان بکات. دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالب ئاماژەی بەتایبەتمەندیەکانی ئەو کەسەدا: کۆکەرەوەی خەوش و خۆڵ، سەرچاوەی خراپیەکان، سەوزەی سەرزەوی دەخوات و پێستەکەی لەبەر دەکات. حەسەن وتی: سوێند بەخوا ئەمە تایبەتمەندیەکانی حەجاجە.

حەبیب کوڕی ئەبی سابت دەڵێت: عەلی بەپیاوێکی وت: نەمریت تا گەنجە سەقەفیەکە ببینیت. پێیان وت: ئەی سەروەری باوەڕداران گەنجی سەقەفی کێیە؟ وتی: پیاوێکە کە رۆژی هەستانەوە پێی دەڵێن: پانتاییەك لەپانتاییەکانی جەهەننەم بۆ ئێمە پڕبکەرەوە و ئەو بەتەنیا پڕی دەکاتەوە، پیاوێك کەبیست یا بیست و چەند ساڵ فەرمانڕەوایەتی دەکات و هیچ گوناحێك لەگوناحەکان نامێنێتەوە مەگەر ئەوەی ئەنجامی دەدات. ئەگەر تەنیا یەك گوناحی نەکراوە مابێت و لەنێوان ئەو و گوناحەکە دەرگایەکی داخراو بێت، بەپێ دەرگاکە دەشکێنێت تا ئەنجامی بدات. بەهێزی ئەوانەی لەژێر فەرمانی ئەودان، کەسانێك دەکوژێت کەرێگەی ناسازگاری ئەو دەگرنە بەر.

دەڵێن: ئەو کەسانەی حەجاج بەئەشکەنجە ئەوانی کوشت، بژاردیان و ژمارەیان بۆ سەد وبیست هەزار کەس بەرز بویەوە. دەڵێن: رۆژێك حەجاج لای خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە تێپەڕی. پیاوێك بەخالیدی وت: ئەمە کێیە؟ خالید وتی: بە بە! ئەمە عەمرۆ کوڕی عاصە. حەجاج ئەمەی بیست و گەڕایەوە و وتی: سوێند بەخوا لەوە شادمان نیم کە عاص کوڕی وایل من بێنێتە دنیا. من زادەی پیرە بەئەزمونەکانی سەقیف و پیاوە فرمزانەکانی قوڕەیشم. ئەو کەسەم بەم شمشێرەی خۆم سەد هەزار کەسم کوشت کەهەمویان شایەتیان دەدا کە باوکت شەرابخۆر بوە و بەنهێنی بتەکانی دەپەرستی. دواتر گەڕایەوە و وتی: بە بە! عەمرۆ کوڕی عاص! ئەمە شایەتی خۆیەتی کە لەبەرابەر یەك نافەرمانی سەد هەزار کەسی کوشتوە.

## کارەکانی محەممەد کوڕی قاسم دوای مەرگی حەجاج و کوژرانی ئەو

کاتێك حەجاج کوڕی یوسف مرد، محەممەد کوڕی قاسم لەملتان بو کەهەواڵی مەرگی ئەوی بیست و بۆ رور و بەغرور گەڕایەوە کەخۆی دەستی بەسەردا گرتبو. بەخششەکانی لەناو خەڵکدا دابەش کرد و بۆ شەڕی دەیلەمیەکان رەوانەی کردن. خەڵکانی بەیلەم شەڕیان نەکرد و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. خەڵکی سورەشتیش داوای ئاشتیان کرد، ئەم شارە شوێنی بەیەك گەشتنی خەڵکانی بەسرەیە و خەڵکەکەی لەرێگەی بازرگانی لەدەریاوە ژیانیان بەسەر دەبرد. دواتر محەممەد بەرەو کیرج بەرێکەوت و دوهر روبەروی بویەوە بەڵام شکستی خوارد و هەڵات و بەوتەی هەندێ کەس کوژرا. خەڵکی شارەکە تەسلیمی فەرمانەکانی محەممەد بون و ئەو دەستی بەکوشتار و ئەسیر کردنی ئەوان کرد. شاعیر وتی:

نحن قتلنا ذاهرا و دوهرا　　　و الخيل تردى منسرا فمنسرا

یانی: ئێمە بوین کە زاهر و دوهرمان کوشت و ئەسپەکان گایەل گایەل بەرەو لەناوچون غاریاندەدا.

وەلید کوڕی عەبدولەلیك مرد و سلێمان کوڕی عەبدولەلیك هاتەسەر کار و یەزید کوڕی ئەبی کەبشەی سەکسەکی وەك فەرمانداری سند دەستنیشان کرد کەمحەممەدی گرت و زیندانی کرد و ئەوی بۆ عێراق گەڕاندەوە. محەممەد ئەم هۆنراوەی خوێند:

اضاعونى و اى فتى اضاعوا　　　ليوم كريهة و سداد ثغر

یانی: منیان پێشێل کرد و چ گەنجێکیان پێشیلْ کرد، گەنجێك بەکاروباری شەڕ و پڕکردنەوەی کەلێنەکان سەرقاڵ بو.

خەڵکی سند بۆ محەممەد گریان. کاتێك گەیشتە عێراق، ساڵح کوڕی عەبدولرەحمان ئەوی لەواست زیندانی کرد. وتی:

فلئن ثويت بواسط و بارضها　　　رهن الحديد مكبلا مغلولا

فلرب قينة فارس قد رعتها　　　و لرب قرن قد تركت قتيلا

یانی: ئەگەر لەسەرزەمینی واست و ناوچەکانی بمێنمەوە و زنجیری ئاسنین لەدەست و پێمدا بێت، زۆر لەهاوسەرانی پاڵەوانەکانم ترساند و زۆر کەسی یاخی و سەرکێشم لەخوێنی خۆیدا گەوزاند.

هەروەها وتی:

ولو كنت اجمعت الفراتر لوطئت          اناث اعدت للوغى و ذكور

و ما دخلت خيل السكاسك ارضنا          و لا كان من عك على امير

و ما كنت للبد المزوني تابعا          فيالك دهر بالكرام عثور

یانی: ئەگەر مەبەستی هەڵاتن لەگۆڕەپانی شەرم لەسەردا دەبو، چەندە زۆربون ئەو ژن و پیاوانەی بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کردبو. هەرگیز سوپای سەکاسك نەیاندتوانی بگەنە ناو سەرزەمینەکەی ئێمە و لەخەڵکانی عەك کەس نەدەبوە فەرمانڕەوای ئێمە و من هەرگیز شوێنکەوتەی بتەکەی مزونی نەبوم. ئەی هاوار لەو رۆژگارەی بەردەوام رێزداران لەزەوی دەدات!

ساڵح ئەوی لەگەڵ دەستەیەك لەبنەماڵەی ئەبو عەقیل ئەشکەنجە کرد تا هەمویانی کوشت. حەجاج ئادەم براگەی ساڵحی کوشت چونکە لەسەر بیروباوەڕی خەواریج ژیانی بەسەر دەبرد. حەمزە کوڕی بەیزی حەنەفی لەپرسەی محەممەد وتی:

ان المروءة و السماحة و الندى          لمحمد بن قاسم بن محمد

ساس الجيوش لسبع عشرة حجة          يا قرت ذلك سودادا من مولد

یانی: جوامێری و بەخشش و دەست کراوەیی تایبەتە بەمحەممەد کوڕی قاسم کوڕی محەممەد. بۆ ماوەی حەفدە ساڵ فەرماندەیی سوپایەکی لەئەستۆدا بو. لەو کاتەوەی لەدایك بو، لەسەرەوەریەوە نزیك بو.

یەزید کوڕی ئەبی کەبشە هەژدە رۆژ دوای گەشتنی بەسەرزەمینی سند کۆچی دوایی کرد و سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك، حەبیب کوڕی موهەلیبی کردە فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە. کاتێك گەیشتە ئەو دیارە، پاشاکانی سند بۆ وڵاتەکەی خۆیان گەڕابونەوە و سوپاکەی جەیشبە کوڕی زاهر بۆ برەهمەن ئاوا رۆشتبو. حەبیب لەکەنارەکانی روباری مێهران دابەزی و خەڵکان لەبەرابەر ئەو سەری ملکەچیان دانەواند. ئەو لەگەڵ خەڵکانێکی دیکە شەڕی کرد و بەسەریاندا سەرکەوت.

دوای ئەوە سلێمان مرد و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتەسەر کار و نامەی بۆ پاشای وڵاتەکان نوسی وپێشنیاری ئیسلام و ملکەچ بونی پێکردن لەسەر ئەو بنەمای کە فەرمانڕەوایەتی ئەوان بکات و ئەومیان پێبېڕێت کە بەموسوڵمانەکان دەبڕێت و ئەومیان

لەسەر بێت کە لەسەر موسوڵمانەکانە. پاشاکان و جەیشبە باوەڕیان هێنا و ناوی عەرەبیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

عەمرۆ کوڕی موسلیمی باهلی کارگوزاری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بو لەو سەرزەمینە. ئەو هێرشی کردە سەر چەندین ناوچە لەهیندستان و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. دواتر جونەید کوڕی عەبدولرەحمان لەرۆژگاری هوشام کوڕی عەبدولمەلیك بوبە فەرمانڕەوایی سند و ڕۆشتە روباری مێهران بەڵام سوپاکەی زاهر ڕێگەی پەڕینەوەیان لێگرتن و زاهر بۆی نوسی: من و کارگوزارەکانم باوەڕمان بەئیسلام هێنا و ئەو پیاوە چاکەکارە منی بۆ ئەم کارە دەستنیشان کرد و من لەتۆ دڵنیا نیم. ئەو بارمتەی بۆ رەوانە کرد و بارمتەی لێگرت و بەڵێنی پێدا باجی وڵاتەکەی بدات. دواتر لەیەك جیابونەوە و جەیشەبە ناباوەڕی هەڵبژاردەوە و شەڕی لەگەڵ موسوڵمانەکان کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو شەڕی  نەکرد بەڵام جونەید ڕێگەی ناسازگاری و ستەم کردنی لەگەڵ ئەو گرتەبەر و لەبەر ئەمە سوپا و کەشتیەکانی کۆکردەوە و بۆ شەڕ خۆی ئامادە کرد. جونەید بەکەشتیە شەڕکەران بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت. لەبوتەیحە روبەروی یەك بونەوە و جەیشەبە ئەسیرکرا چونکە کەشتیەکەی لەقوڕ چەقیبو. جونەید ئەوی کوشت و صەعصەعە کوڕی زاهر هەڵات و مەبەستی ڕۆشتن بۆ عێراقی کرد تا سکاڵا لەپەیمان شکێنی جونەید بکات. جونەید ڕێگەی چاکە و نەرمی لەگەڵ گرتەبەر تا ئەو کاتەی دەستی خستە ناو دەستی جونەید و جونەید لەم کاتەدا کوشتی.

جونەید بۆ شەڕی کیرج بەرێکەوت چونکە ئەوان پەیمانەکەی خۆیان شکاندبو. ئەو قەلاکوتێکی هەڵگرت و دیواری شارەکەی پێ وێران کرد و ڕۆشتە ناو شارەکە و بەکوشتار و ئەسیر کردنی خەڵکان سەرقاڵ بو و کارگوزارەکانی بۆ مەرمز و مەندەل و دەهنەج و بورۆنج رەوانە کرد. جونەید بەردەوام دەیوت: ئەگەر بێ ئۆقرەیی بکەن زیاتر لەوەیان لێدەکوژرێت کە لەکاتی خۆراگری لێیان دەکوژرێت. سوپایەکی بۆ ئۆزیەن رەوانە کرد. ئەم سوپایە هێرشی برد و دەوروبەری شارەکەیان سوتاند. جونەید دەستی بەسەر بەیلماندا گرت و جگە لەوەی خۆی بردی، چل هەزار درەم کۆکرایەوە و بەو ئەندازەیە، خۆی هەڵیگرت. جونەید، تەمیمی کوڕی زەیدی قینی دەستنیشان کرد کە ناتەوانی لەخۆی نیشاندا و لەنزیکی دەیبول مرد.

لەرۆژگاری ئەو موسوڵمانان لەوڵاتی هند هاتنەدەر و پێگە و شوێنەکانی خۆیان بەجێهێشت. دواتر حەکەم کوڕی عەوامی کەلبی هاتەسەر کار و خەڵکانی هند ناباوەڕ بون جگە لە خەڵکی قەصە. ئەو بناغەی شارێکی دارشت و ناوی ناو مەحفوزە و کردی بەپەناگەی موسوڵمانان. عەمرۆ کوڕی محەممەد کوڕی قاسم هاورێیەتی دەکرد کەحەکەم کارە دژوارەکانی بەو دەسپارد. ئەوی لەشاری مەحفوزەوە بۆ شەڕ رەوانە کرد. کاتێك گەڕایەوە، ئاگاداری کردەوە کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. شارێکی دروست کرد و ناوی نا مەنسورە. ئەو شارەیە کە فەرمانداراەکان لەوێ دادەبەزن. ئەوەی دەست دوژمن کەوتبو، لەدەستی ئەوانی دەرهێنا و خەڵکەکەی گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا. خالیدی قەسری دەیوت: سەیرە! جوامێری عەرەبەکان (یانی تەمیمیەکانم) بۆ هەڵسورانی کارەکان راسپارد بەلاّم خەڵك ئەویان بەتەنیا جێهێشت. دواتر بەرچاو تەنگترین پیاوی عەرەبەکانم بۆ راپەڕاندنی کارەکان دەستنیشان کرد و خەڵکان ملکەچی فەرمانەکانی بون. دواتر حەکەم کوژرا. کارگوزارەکانی بۆ شەڕی دوژمنان دەڕۆشتن و دەستیان بەسەر ناوچەکاندا دەگرت و ئەوەی دەیانویست، هەڵیان دەگرت چونکە دەوڵەتی ئومەوی لەو کاتەدا لاواز و ناتەوان بو تا سەردەمی دەرەوشاوەی دەوڵەتی عەباسی نزیك کەوتەوە. ئێمە بەخواستی خوا گێڕانەوەکانی تایبەت بەسند لەکاتی خەلافەتی مەئمونی عەباسی ئاماژە پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و هێراکلە و شوێنەکانی دیکەی گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا سەراسەری هند دەستی بەسەرداگیرا جگە لەکیرج و مەندەل.

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید دەستی بەسەر قێنسریندا گرت.

لەم ساڵەدا وەزاحی و نزیکەی هەزار پیاو کەهاورێیەتی ئەویان دەکرد، لەسەرزەمینی رۆم کوژران.

لەم ساڵەدا مەنصور، عەبداللە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عەباس چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا بشر کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ خەڵك حەجی کرد.

کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵانی پێشو بون.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەبو عوسمان عەبدولرەحمان کوڕی مەل نەهدی لە تەمەنی ١٣٠ ساڵی کەسەبارەت بەمەرگی ئەو ئاماژەیان بەگێرانەوەیەکی دیکە داوە، ئەبو عەمرۆ سەعد کوڕی ئەیاسی شەیبانی لەتەمەنی ١٢٠ ساڵی، سوفەینە کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) کە لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی حەجاج مرد، سالم کوڕی ئەبی جەعد، جەعفەر کوڕی عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەمری برای شیری عەبداللە کوڕی مەروان، ئەبو ئەحوەص عەوف کوڕی مالك کوڕی نەزلەی جوشەمی کوفی کە لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی حەجاج بەدەستی خەواریج کوژرا.

## روداوەکانی ساڵی نەوەد و شەشی کۆچی ( ٧١٤- ٧١٥ زایینی )

## گرتنی شاری کاشغەر لەسەر دەستی قوتەیبە

لەم ساڵەدا قوتەیبە لەکاشغەر شەڕی کرد. بۆ ئەو دیارە بەرێکەوت و ژنان و مناڵانی شەڕکەرانی سوپاکەی لەگەڵ خۆی برد تا ئەوان لەسەمەرقەند بەجێبێڵێت. کاتێك لەروبار تێپەڕی، پیاوێکی لەسەر رێگای روبارەکەدانا تا رێگە نەدات ئەوانەی دەگەڕێنەوە بەبێ مۆڵەتی ئەو لەروبارەکە بپەڕێنەوە. بەرەو فەرغانە بەرێکەوت و کەسانێکی بۆ دۆڵی عەصام رەوانە کرد تا رێگەی کاشغەر خۆش بکەن. ئەمە نزیکترین شارەکانی چینە. لەگەڵ بەهمەن کوڕی کەبیر سوپایەکی بۆ کاشغەر رەوانە کرد کە تالآنی زۆریان دەستکەوت و چەندین کەسیان ئەسیر کرد. ملی ئەوانی مۆر کرد و لەقولایی سەرزەمینی ئەوان پێشڕەوی کرد تا لەچین نزیك کەوتەوە.

پاشای چین بۆی نوسی: پیاوێکی رێزدار بۆ لای من رەوانە بکە تا لەخۆتان و دینەکەتان ئاگاداری بکاتەوە. قوتەیبە دەپیاوی جوان روخسار و قسە خۆش و بەهێز و خواپەرست و فرمزانی هەڵبژارد و فەرمانیدا بەباشترین شێوە بیانرازێننەوە و باروبنەی فراوانیان بخەنە بەردەست و جل وبەرگی گرانبایی لەهەوریشمیان لەبەر و سوار ئەسپە رەسەنەکانیان بکەن. هوبەیرە کوڕی موشەمرەجی کەلابی هاورێی ئەوانی دەکرد. بەوانی وت: کاتێك دەڕۆنە لای پاشای چین، ئاگاداری بکەنەوە کە من سوێندم خواردوە نەگەڕێمەوە تا ئەو کاتەی سەرزەمینەکەی ئەوان بەسمی ئەسپەکانی خۆم دەشێلم و مۆر لەملی پاشاکەی ئەوان بدەم و باج کۆبکەمەوە.

ئەوان بەسەرکردایەتی هوبەیرە بەرێکەوتن. کاتێك گەیشتن، پاشای چین ئەوانی بانگێشت کرد. ئەوان لەسەر جل و بەرگە زێرینەکانی خۆیان جلی سپیان لەبەر کردبو، عاباکانیان خستبوە سەرشان و قاچیان بەپێڵاوی جوان و بۆنی خۆشیان لەخۆیان دابو. لەکاتێکدا گەورەکانی وڵاتی چین لای پاشا بون، رۆشتنە لای. پاشا یا هیچ کام لەهاوەڵانیان قسەیان لەگەڵ نەکردن. ئەوان هەستان و هاتنەدەر. پاشا بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەوانتان چۆن بینی؟ وتیان: کەسانێکمان بینی کە هاوشێوەی ژنەکانی ئێمە بون.

بۆ بەیانی، ئەوانی بانگ کردەوە. جل و بەرگی ئاڵ و واڵایان لەبەر کرد و دەستاری خەزیان لەسەرنا و عابا بەزێر چنراوەکانیان خستە سەرشان و لەکاتی بەرەبەیان رۆشتنە لای پاشا. کاتێك رۆشتنە ژوور، پێیان وترا بگەرێنەوە. پاشا بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەمرۆ ئەوانتان چۆن بینی. وتیان: ئەمرۆ هاوشێوەی پیاوان بون. بۆ رۆژی سێیەم ئەوانی بانگ کردەوە. ئەوان جل و بەرگی شەریان لەبەر کرد و خودەیان کردە سەر. شمشێری ئاودار و رمی گیان ستێنیان هەڵگرت و تیروکەوانیان کردە شان. پاشا سەیری کردن و ئەوانی بەکێوی ئاسنین هاتەبەرچاو. کاتێك نزیك کەوتنەوە، رمەکانیان لەزەوی کوتا و بۆ پێشەوە رۆشتن. بەوان وترا: بگەرێنەوە. سوارئەسپەکانی خۆیان بون و بۆ پێشەوە غاریاندا وەك بڵێی لەناو گۆرەپانی شەردان. پاشا بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەوان چۆن دەبینن؟ وتیان: هەرگیز هاوشێوەی ئەوانمان نەبینیوە.

کاتێك شەو داهات، کەسی بۆ لای ئەوان رەوانە کرد و وتی: سەرۆکەکەی خۆتان بۆ لای من بنێرن. ئەوان هوبەیرە کوری موشەمرەجیان رەوانە کرد. پاشایی چین پێی وت: شکۆ و مەزنی منتان بینی و بینیتان کەس ئێوەی لەزیانی من نەپاراست، ئێوە هاوشێوەی هێلکە لەدەستی مندان. پرسیارێکتان لێدەکەم کەئەگەر راستیەکەی بەمن نەڵێن، دەتانکوژم. وتیان: بپرسە. وتی: بۆ لەرۆژی یەکەم و دوەم بەو شێوەیە هاتنە لای من؟. وتیان: رۆژی یەکەم ئەو جل و بەرگەیە کە لەناو کەسەکانی خۆمان لەبەری دەکەین، رۆژی دوەم بۆ کاتێکە کە بۆ وەرگرتنی ئەمان دەرۆینە لای فەرمانرەواکانی خۆمان و رۆژی سێیەم بۆ روبەروبونەوەی دوژمنانە. پاشا وتی: بەشێوەیەکی جوان رۆژگار بەسەر دەبەن. بەسەروەری خۆتان بڵێن بگەرێتەوە چونکە من لەکەمی ژمارەی سوپاکەی ئەو ئاگادارم. ئەگەر نەگەرێنەوە، سوپایەك رەوانە دەکەم تا لەناوتان ببات. وتیان: چۆن سوپاکەمان ژمارەکەی کەمە لەکاتێکدا پێشەنگەکانی لای تۆیە و کۆتایی سوپاکە لەشوێنی روانی دارزەیتون؟ بەڵام ئەوەی کە ئێمە لەکوشتن دەترسێنیت، ئێمە هەمومان رۆژێکی کۆتاییمان هەیە و ئەگەر کاتی بگات، باشتر وایە بکوژرێین. ئێمە نە لەمەرگ دەترسین نە لەکوشتن. سەروەری ئێمە سوێندی خواردوە نەگەرێتەوە تا سەرزەمینی ئێوە لەژێر سمی ئەسپەکانی پێشێل بکات و مۆر لەملی پاشا بدات و باجتان لێوەربگرێت.

پاشا وتی: ئێمە سوێندەکەی دەهێنینە دی. کەمێك خاك دەنێرین تا ئەسپی لەسەر

غار بدات، دەستەیەك لەمناڵەکانی خۆمان دەنێرین تا مۆر لەملیان بدات و باجی بۆ ڕەوانە دەکەین تا پەسەندی بکات. پاشا دیاری بۆ ڕەوانە کرد و چوار لەشازادەکانی نارد و لەگەڵ ئەوان خاك. چاکەی لەگەڵ نێردراوەکان کرد و ڕێزی گرتن. ئەوان ڕۆشتنە لای قوتەیبە. قوتەیبە باجەکەی وەرگرت و مۆری لەملی شازادەکاندا و بەسەر خۆڵەکە ئەسپی غاردا. سەواد کوڕی عەبدولمەلیکی سەلولی وتی:

لاعیب فی الوفد الذین بعثهم     للصین ان سلکوا طریق المنهج

کسروا الجفون علی القذی خوف الردی     حاشا الکریم هبیرة بن مشمرج

ادی رسالتك التی استرعیته     فاتاك من جنث الیمین بمخرج

یانی: ئەو نوێنەرانەی بۆ چین ڕەوانەت کرد، هەمویان لەسەر ڕاستی و دروستی بون. پێڵوەکان لەیەك نەدران و لەترسی لەناو چون ئەو کارەیان کرد، هەر بژیت ڕێزدارێك کە هوبەیرە کوڕی موشەمرەجە. بەباشترین شێوە پەیامەکەی گەیاند و ڕێگەی نەدا سوێندەکەت بکەوێت.

قوتەیبە هوبەیرەی بۆ لای وەلید ڕەوانە کرد. ئەو لەدێهاتێکی پارس مرد و سەواد لەپرسەی ئەودا وتی:

لله در هبیرة بن مشمرج     ماذا تضمن من ندی و جمال

و بدیهة یعیابها ابناؤها     عند احتفال مشاهد الاقوال

کان الربیع اذا السیوف تتابعت     و اللیث عند تکعکع الابطال

فسقی بقریة حیث امسی قبره     غر یرحن بمسبل هطال

بکت الجیاد و الصافنات لفقده     و بکاه کل مثقف عسال

و بکته شعث لم یجدن مواسیا     فی العام ذی السنوات و الامحال

یانی: خۆشەویستی خوای لەسەر بێت هوبەیرە کوڕی موشەمرەج چونکە هۆکارەکانی فراوانی و بەخشندەیی لەگەڵدا بو. وتارێکی لەناکاو و جوانی دەهێنایە سەرزمان و ئەمە لەکاتێکدا بو منداڵەکانی ئەم زمانە لەوتار ناتەوان دەبون و شاعیرە پایەبەرزەکان لەکۆڕەکان زمانیان وەك هەنگوین بۆ وتار دەکردەوە. کاتێك شمشێرەکان یەك لەدوای یەك دادەبارین، ئەو بەهاران بو. و کاتێك پاڵەوانەکان ژیانیان دەستاند، ئەو شێری ژیان بو. لە(قەریە) ئەو شوێنەی ئارامگاکەیەتی، هەورە باران زاکان ئەویان تێراو کرد. ئەسپە

تیژپێکان بۆ ڕۆشتنی ئەو گریان و هەر ڕمێکی نەرمی چەماوە بارانی فرمێسکیان لەنوکی ڕمەکانەوە باراند. هەمو ژنە قژ پەرێشانەکان شیینان بۆ گرد کە لەدوای ئەو، لەوشکەسالیەکان و قاتوقڕیەکان سەرپەرەستێکی ڕێزداریان بەخۆیانەوە نەبینی.

قوتەیبە سەرقالی شەڕ بو کە هەواڵی مەرگی وەلیدی پێگەیشت.

هەرساڵ کە قوتەیبە لەشەڕ دەگەڕایەوە، دوانزە ئەسپ و دوانزە ماینی دەکڕی و تاکاتی شەڕ چاوەڕوان دەبو. کاتێك، وەرزی شەڕ دەهات، ئەوانی دەستەمۆ دەکرد و پێشەنگەکانی سوار دەکرد. پێشەنگەکانی لەناو سوارکارە ئازاکانی سوپاکەی هەڵدەبژارد و کەسانێکی لەعەجەمەکان دیاری دەکرد تا ڕاوێژیان لەگەڵ بکات و گوێ لەئامۆژگاریەکانیان بگرێت. کاتێك پێشەنگەکانی ڕەوانە دەکرد، فەرمانی دەدا، تەختەیەك بێنن و نیگارێکی لەسەر بکێشن. دواتر دەیکرد بەدو لەت. نیوەی خۆی هەڵیدەگرت و نیوەی دەدا بەپێشەنگەکان تا لەشوێنی دیاریکراودا ( لەبن دار یا نزیك ئاوێك) بەخاکی بسپێرن. بەدوای پێشەنگەکان کەسێکی ڕەوانە دەکرد تا بزانێت ڕاستیان وتوە یا نا.

لەم ساڵەدا بوشر کوڕی وەلید شەری زستانەی کرد و ئەمە لەکاتێکدا بو وەلید ماڵئاوایی لەجیهان کردبو.

## مردنی وەلید کوڕی عەبدولەلیك

لەنیوەی جەمادی الثانی ئەم ساڵە/ ٢٥ فەوریەی ٧١٥ زایینی وەلید کوڕی عەبدولەلیك مرد. گێڕانەوەیەکە کە هەمو مێژوونوسان لەسەری کۆکن. ڕۆژگاری خەلافەتی وەلید نۆ ساڵ و حەوت مانگ یا نۆ ساڵ و هەشت مانگ یا پانزە مانگ درێژەی کێشا. ئەو لەدێری موڕان بو و ئەویان لەدەرەوەی (دەروازەی خرد) بەخاك سپارد. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوێژی لەسەر خوێند. ساڵەکانی تەمەنی چل و دو ساڵ و شەش مانگ یا ٤٥ ساڵ یا ٤٦ ساڵ یا ٤٩ ساڵ درێژەی کێشا. نۆزدە کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت. پیاوێکی ناشیرین و خراپەکار بو. کاتێك بەرێگادا دەڕۆشت، بێدادگەری دەکرد. بەردەوام ئاو لەلوتی دەهاتە خوار. سەبارەت بەو وتیان:

فقدت الولید و انفا له        کمپل العصیل بدا ان یبولا

یانی: وەلیدم لەدەستدا و لوتی ئەو، هاوشێوەی بێچوە وشترێکی جیا لەدایکی بو

کەبەردەوام بیەوێت میز بکات.

کاتێك جەستەیان شۆڕ کردەوە، ئەژنۆکانی بەرەو ملی چەمانەوە. کوڕەکەی پرسی: باوکم چۆن ژیانی بەسەر برد؟ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بو وەلیدیان بەخاك دەسپارد، وتی: سوێند بەخوا باوکت خێرا ماڵئاوایی لێکردین. عومەر وانەی لە وەلید وەرگرت.

## کرداری وەلید

وەلید لای خەڵکانی شام باشترین خەلیفەی ئەوان بو. چەندین مزگەوتی دروست کرد کە مزگەوتی مەدینە و مزگەوتی شام لەوان بون. هەروەها (مسجد الاقصی) نۆژەن کردەوە. زێری بەسواڵکەرەکان دەبەخشی. بەهەر پەککەوتەیەك نۆکەرێکی بەخشی و بۆ هەر کوێرێك رێنیشاندەرێك. لەکاتی خەلافەتی ئەو چەندین وڵات دەستیان بەسەردا گیرا کە ئاندۆلۆس و کاشغەر و هیند لەناویاندا بون.

هەندێ کات لای سەوزە فرۆشێك تێدەپەڕی و دەسکەیەك سەوزەی لێدەکری و دەیپرسی: بایی چەندە؟ دەیوت: فلسێك. وەلید دەیوت: بەهاکەی زیاد بکە.

حەزی لەبیناسازی و زەویداری دەکرد. خەڵکان لەرۆژگاری ئەو چاویان بەیەك دەکەوت و سەبارەت بەکار و باری بیناسازی پرسیاریان کرد. سلێمان کوڕی عەبدولەلیك شەرابخۆر و مێباز بو و خەڵك لەرۆژگاری ئەو سەبارەت بەخواردن و کردن پرسیاریان لەیەك دەکرد. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز پیاوێکی خواپەرەست بو و خەڵك لەرۆژگاری ئەو سەبارەت بەکارە چاکەکان پرسیاریان دەکرد و دەیانوت: دوێنێ شەو چیت بینی، چەند سورەی قورئانت لەبەرە و چەندە بەرۆژو دەبیت؟

وەلید پێش مردن نەخۆش کەوت و بێهۆش بو و ئەو چەند رۆژەی نەخۆشی بەشێوەی مردوەکان ژیانی بەسەر برد. پرسەیان بۆ گێڕا و پەیکەکان هەواڵی مەرگی ئەویان بۆ ئەم لاولا گواستەوە. حەجاج وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). ئەو خۆی بەستونێکەوە بەستەوە و وتی: ئەی خوایە، کەسێك مەکەرە فەرمانڕەوایی من کەخۆشەویستی لەدڵدا نەبێت چونکە زۆر جار ئارەزووم کرد من پێش ئەو بمرێنیت! بەم شێوەیە گریا تا پەیك هات و هەواڵی بەهۆش هاتنەوەی وەلیدی پێدا. کاتێك وەلید هاتەهۆش، وتی: کەس بەئەندازەی حەجاج لە

بەۆش هاتنەوەی من شادمان نەبو. زیندو مایەوە تا حەجاج ڕۆشتە لای.

وەلید دەیویست براکەی لەسەر کار لاببات و بۆ کوڕەکەی خۆی عەبدولعەزیز بەیعەت وەربگرێت بەلأم سلێمان رازی نەبو. نامەی بۆ کارگوزارەکانی خۆی نوسی و ئەم پێشنیارەی پێکردن بەلأم جگە لەحەجاج و قوتەیبە کەس رازی نەبو. وەلید نامەی بۆ سلێمان نوسی و بانگی کرد. سلێمان خۆی ماتڵ کرد. وەلید بڕیاریدا خۆی بڕوات و لەسەر کار لاییبات، خێوەتەکانی خۆی ئامادە کرد بەلأم پێش ڕەوانە بون کۆچی دوایی کرد.

کاتێك مەبەستی ئەوەی کرد مزگەوتی دیمەشق دروست بکات، کەنیسەیەکی لەوێ بینی کە خاپوری کرد و بناغەی مزگەوتەکەی دارشت. کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتەسەر کار، مەسیحیەکان سکاڵایان گەیاندە لای ئەو. عومەر بەوانی وت: ئەوەی لەدەرەوەی شاردابوە بەزۆری شمشێر دەستی بەسەرداگیراوە، ئێمە کەنیسەکەتان بۆ دەگەڕێنینەوە بەلأم کەنیسەی (توما) کە بەزۆر دەستی بەسەردا گیراوە، وێران و لەجێگەکەی مزگەوتێك دروست دەکەین. وتیان: نا، ئەو کەنیسەیە بۆ ئێوە و کەنیسەی تۆما بۆ خۆمان.

وەلید لەکاتی قسە کردن بەناراستی وتەکانی دەهێنایە سەرزمان چونکە ڕێزمانی عەرەبی بەباشی نەدەزانی. عەرەبێکی بیابان نشین ڕۆشتە لای و باسی زاواکەی کرد کەپەیوەندی لەگەڵیدا هەیە. وەلید وتی: (من ختنك)( بەفەتحەی لەسەر نون) چ کەسێك تۆی خەتەنە کردوە؟ دەبو بڵێت: (من ختنك) (بەزەممەی نون)یانی: زاواکەی تۆ کێیە؟ عەرەبی بیابان نشین گومانی ئەوەی کرد پرسیاری خەتەنە دەکات نەك زاواکەی. وتی: یەکێك لەپزیشکەکان. سلێمان وتی: سەرومری باوەڕداران دەپرسێت من ختنك (بەزەممەی نون) (زاواکەی تۆ کێیە؟) بیابان نشین وتی: ئاها، فلأن کەس. باوکی بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەی دەکرد و دەیوت: کەس نابێتە سەروەری عەرەبەکان مەگەر ئەوەی بەتەواوی شارەزایی زمانی ئەوان بێت. ئەو شارەزایانی ڕێزمانی کۆکردەوە و ڕۆشتە ناو ماڵێك. بۆ ماوەی شەش مانگ مایەوە وشەو و ڕۆژ هەوڵیدا بەلأم لەرۆژی یەکەم نەزانتر هاتەدەر. عەبدولەلیك پاساوی بەدەستەوە نەما. کاتێك هاتەسەر کار، هەر سێ ڕۆژە و خەتمێکی قورئانی دەکرد. لەمانگی ڕەمەزان ڕۆژی یەك جار قورئانی خەتم دەکرد.

ڕۆژێك وتاری بۆ خەڵك دەدا و ئەم ئایەی بەمشێوەیە خوێندەوە: ( یا لیتها کانت القاضیة (الحاقه/٢٧/٦٨) بەزەممەی تا ءخوێندیەوە (یانی خۆزگە مەرگ دەبو). عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کە لەوێ ئامادەبو، وتی: بەڵێ، خۆزگە کاتی مەرگی تۆ دەهات و ئێمەی ئاسودە دەکرد.

## خەلافەتی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك وبەیعەتی خەڵکان لەگەڵ سلێمان

لەم ساڵەدا، لەو ڕۆژەی کە وەلید چاوی لەدنیا بەست، خەڵك لەگەڵ سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك بەیعەتیان بەست. ئەو لەم کاتەدا لەشاری ڕەملە (لەشارەکانی فەلەستین) ژیانی بەسەر دەبرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەوت ڕۆژ بۆ کۆتایی ڕەمەزان/ یەکی ژوئەنی ٧١٥ زایینی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك، عوسمان کوڕی حەیانی (فەرمانداری مەدینە) لەسەر کار لابرد و لەجێگەکەی ئەو ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی حەزمی دەستنیشان کرد. عوسمان سوێندی خواردبو بۆ بەیانی بەقامچی لەمحەممەد دەدات و ڕیشی دەتاشێت. کاتێك شەو داهات، پەیك گەیشت و ڕۆشتە ماڵی ئەبوبەکر و ئەوی وەك فەرماندار ناساند و فەرمانی لەسەر کارلابردن و لیدان و زیندانی کردنی عوسمانی پێدا.

هەروەها لەم ساڵەدا سلێمان، یەزید کوڕی ئەبی موسلیم (فەرمانداری عێراق)ی لەسەر کار لابرد و یەزید کوڕی موهەلبی کردە فەرماندار و ساڵح کوڕی عەبدولرەحمانی کردە سەرپەرەستی باج و خەراج و فەرمانی پێدا بەنی عەقیل کوشتار وئەشکەنجە بکات چونکە ئەوان لەبنەماڵە و کەسەکانی حەجاج بون. ئەو کەسەی کاری ئەشکەنجە کردنی گرتە ئەستۆ، عەبدولمەلیك کوڕی موهەلیب بو. یەزید کوڕی موهەلیب زیاد کوڕی موهەلیبی بۆ شەڕ لەگەڵ عوسمان دیاری کردبو.

## کوژرانی قوتەیبە

لەم ساڵەدا قوتەیبە کوڕی موسلیمی باهلی لەخوراسان کوژرا.

داستانی کوژرانی بەمشێوە بو کە وەلید کوڕی عەبدولمەلیك مەبەستی ئەوەی کرد سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك وەك جێگری خۆی لەخەلافەت لەسەر کار لاببات و کوڕەکەی خۆی یانی عەبدولعەزیز کوڕی وەلید بۆخەلافەت دەستنیشان بکات. بەهەمان شێوە گەناماژەمان پێدا، حەجاج و قوتەیبە لەم کارەدا هاوکاریان دەکرد. کاتێك وەلید مرد و سلێمان هاتە سەر تەخت، قوتەیبە ترسا کەسلێمان، یەزید کوڕی موهەلیب وەك فەرمانڕەوایی خوراسان دەستینشان بکات. قوتەیبە نامەیەکی بۆ سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك نوسی و پیرۆزبایی لێکرد و ئەزمونی گوێرایەڵی و فەرمان بردنی خۆی لەوەلید و عەبدولمەلیك بیرخستەوە و وتی ئەگەر لەفەرمانڕەوایەتی خوراسان دوری نەخاتەوە، هاوشێوەی ئەوان گوێرایەڵ و فەرمانبەری ئەمیش دەبێت. نامەیەکی دیکەی نوسی و سەرکەوتنەکان و وڵات گرتنەکان و پێگەی و شکۆی خۆی لای ئێرانیەکان هێنایە سەر زمان و سەرکۆنەی بنەماڵەی موهەلیبی کرد و سوێندی خوارد ئەگەر یەزید بکاتە فەرمانڕەوای خوراسان ئەو لەسەر کار لادەبات. نامەی سێیەمی نوسی و سلێمانی وەك خەلیفە لەسەر کار لابرد. نامەکانی بەپیاوێك لەخەڵکی باهلە رەوانە دەکرد و پێی وت: نامەی یەکەمی پێ بدە، ئەگەر یەزید لەوێ بو، نامەکە بخوێنێتەوە و پێی بدات، نامەی دوەمی پێ بدە ئەگەر بیخوێنێتەوە و بیدات بەیەزید، نامەی سێیەمی پێبدە. ئەگەر نامەی یەکەمی خوێندەوە و نیشانی یەزیدی نەدا، دو نامەکەی دیکەی نیشان نەدات.

نێردراوی قوتەیبە گەیشتە لای سلێمان و بینی کە یەزید کوڕی موهەلیب لای ئەو دانیشتوە. نامەکەی پێدا کە سلێمان خوێندیەوە و بەیەزیدیدا. نامەی دوەمی پێدا کەخوێندنیەوە و نیشانی یەزیدیدا. نامەی سێیەمی خوێندەوە کە رەنگی روخساری گۆڕا و مۆری کرد و نیشانی کەسی نەدا.

دەستەیەك دەڵێن: لەنامەی سێیەمدا نوسرابو، ئەگەر من وەك فەرمانڕەوای خوراسان نەهێڵیتەوە و ئەمان و ئارامیم پێ نەبەخشی، بێ گومان تۆ لەسەر کار لادەبەم و پایتەختەکەت پڕدەکەم لەسوار و پیادەکان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ تۆ.

دواتر سلێمان فەرمانیدا شوێنی حەوانەوە بۆ نێردراوەکەی قوتەیبە ئامادە و رێزی

لێ بگرن. شەو بانگی کرد و هەزاران دیناری پێبەخشی و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی قوتەیبەی لەخوراسان پێدا و نێردراوێکی لەگەڵ ئەو ڕەوانە کرد. کاتێك هەردوکیان گەشتنە حولوان، هەواڵیان پێگەیشت کە قوتەیبە چیتر گوێ لەفەرمانەکانی سلێمان ناگرێت. نێردراوی سلێمان گەڕایەوە.

کاتێك قوتەیبە بڕیاریدا سلێمان لەسەر کار لاببات، ڕاوێژی بەبراکانی خۆی کرد. عەبدولرەحمانی برای پێی وت: دەستەیەك هەڵبژێرە و هەر کەسێك لێی دەترسی لەناو ئەو دەستەدا دابنێ و دەستەیەکی دیکە بۆ مەرو ڕەوانە بکە و بەرێکەوە تا لەسەمەرقەند دابەزیت. بەهاورێکانی خۆت بڵێ: هەرکەس ئارەزوی مانەوەی هەیە نامە بنوسێت و هەرکەس دەخوازێت بڕوات، زۆری لەسەر نیە. تەنیا چاکەخوازان لای تۆ دەمێننەوە و کەس ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ تۆ ناگرێتەبەر.

عەبداللەی برای پێی وت: لێرە سلێمان لەسەر کار لاببە چونکە هیچ کەس سەرپێچی لەفەرمانی تۆ ناکات. قوتەیبە لەوێ سلێمانی لەسەر کار لابرد و خەڵکی بۆ ئەو کارە هاندا و خراپەکاری پێشینیانی سلێمان و کرداری سەرکۆنەکراوی ئەوانی بیری خەڵکان خستەوە. کەس وەڵامی نەدایەوە. قوتەیبە توڕە بو و وتی: خوا سەرکەوتنی پێ نەبەخشێت ئەو کەسەی ئێوە هاوکاری دەکەن. سوێند بەخوا ئێوە لەدەوری بزنێك کۆبونەوە و نەتانتوانی شاخەکانی بشکێنن، ئەی خەڵکانی پەستی بێ سەر و پێی زەکاتخۆر! بەهەمان شێوە کەوشترەکانی زەکات کۆدەکەنەوە، ئێوەم لەکەنارەکانەوە کۆکردەوە! ئەی خەڵکی بەکر کوڕی وایل! ئەی خواوەندی درۆ و فێڵ و فریو! شانازی بەکام کارەی خۆتانەوە دەکەن؟ بەشەرەکان یا ئاشتیەکان؟ ئەی شوێنکەوتەکانی موسەیلەمەی درۆزن! ئەی بەنی زەمیم و ئاڵێم بەنی تەمیم! ئەی هاورێیانی شەراب خۆرەکان و ئەی شوێنکەوتەکانی ستەمکاری، لەرۆژگاری جاهلی فێڵ و فریوتان بەزیرەکی لەقەڵەمدەدا! ئەی شوێنکەوتەکانی سەجاح! (شوێنکەوتەکانی ژنی پێغەمبەر ناسای درۆزنە) ئەی خەڵکی بێ بەزەیی عەبد قەیس، جڵەوی ئەسپەکانتان گرتوە! ئەی خەڵکی ئەزد، لەجیاتی تەنافە ئەستورەکانی کەشتی، تەناف زێڕینی سوارکاریتان بەدەست هێناوە! ئەمە لەئایینی ئیسلام کارێکی سەرکۆنە کراوە. ئەی هیچ و پوچەکانی دوشارەکە! لەشوێنی ڕوانی (قەیسوم) (مەشکە یا تورەکەی شوان) و گیاکان ئێوەم

کۆکردەوە کە سوارکەر وگا دەبون! کاتێك کۆبونەوە، ئەمە و ئەوەتان وت! سوێند بەخوا وەك لاولاو لەیەکتانەوە دەئاڵێنم! بەدوای ئەم (صلیانە) (گیایەکە کە وشتر حەزی لەخواردنیەتی) ئەرەی شێران دێت! ئەی خوراسانیان، ئایا دەزانن کێ بۆتە فەرمانڕەواتان. یەزید کوڕی مەروان بۆتە فەرمانڕەوایی ئێوە. لەئێستاوە دەتوانم ببینیم کە فەرمانداری تازە دێت و دەست بەسەر ماڵ و سامانی ئێوەدا دەگرێت. دوورترین نیشانەکان تیرباران بکەن. خەڵکانی شام تا کەی دەیانەوێت ئێوە بدۆشن؟ ئەی خەڵکانی خوراسان! لەپشتەکانی من بکۆڵنەوە تا بزانن لەروانگەی دایك و باوك و زادگە و دین و ئارمان عێراقیم و ئێوە ئەم ئارامی و ئاسایشەتان پێبڕاوە کە دەیبینن. خوا دەرگای شارەکانی بەروی ئێوەدا کردۆتەوە و تالآنیەکانی ئێوەی پاراستوە. ژن سوار لەسەر وشتر لەشاری مەرو دەڕواتە خوراسان بێ ئەوەی ترسی هەبێت و ئازاری پێ بگات. بۆ ئەم ئارامیە سوپاسی خوا و داوای زیاتری لێ بکەن.

دواتر دابەزی و ڕۆشتە ناو ماڵەکەی خۆی. کەسەکانی هاتنە لای و سەرکۆنەیان کرد و وتیان: هیچ کات تۆمان هاوشێوەی ئەمڕۆ نەبینیوە. وتی: کاتێك قسەم کرد و کەس وەڵامی نەدامەوە، توڕە بوم و نەمزانی چیم هێنایە سەرزمان. خەڵکان پەرێشان بون و لەسەر کار لابردنی سلێمانیان بەناخۆش دەزانی و لەبەر ئەمە بۆ دژایەتی کردنی قوتەیبە هاودەنگ و هاوڕابون. یەکەم کەسان کە قسەیان کرد، خەڵکانی ئەزد بون. ڕۆشتنە لای حوصەین کوڕی مونزەر و وتیان: ئەو پیاوە داوای لەسەر کار لابردنی خەلیفە دەکات کەدەبێتە هۆی فیرۆیی ژیان و ئایینی ئەم جیهانەمان، جوێنی بەئێومیشدا، دەڵێی چی؟ وتی: خەڵکانی موزەر لەخوراسان فراوانن و تەمیم زۆرینەی ئەوانن و ئەوان سوارکارە بەئەزمونەکانی خوراسانن و رێگە نادەن جگە لەخەڵکانی موزەر کەس فەرمانڕەوایەتی ئەوان بکات. ئەگەر لەو کارە دوریان بخەنەوە، هاوکاری قوتەیبە دەکەن. ئەم ئامۆژگاریەیان لەگوێ گرت و وتیان: لەخەڵکانی تەمیم چ کەسێك پەسەند دەکەیت؟ وتی: جگە لەوەکیع کەس پەسەند ناکەم. حەیانی نەبتی موالی بەبەنی شەیبان وتی: کەس جگە لە وەکیع جڵەوی ئەم کارە ناگرێتە دەست، لەهەتاوی گەرم و سوتێنەر نوێژ دەخوێنێت و خوێنی خۆی دەبەخشێت و خۆی بۆ کوژران تەرخان دەکات. ئەگەر فەرمانداری تازە بگات، بۆ گوناحەکانی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ

دەکات، ئەو بیر لەئەنجامی کارەکان ناکاتەوە. بنەماڵەیەکی هەیە کە پارێزگاری لێدەکەن. جیاواز لەوە، ئەو داغدارە و خوازیاری خوێنی قوتەیبەیە چونکە فەرمانڕەوایی لێ وەرگرتەوە و بەزەرار کوڕی حوصەینی زەببی بەخشی.

خەڵك بەنهێنی هاتوچۆی یەکیان دەکرد و شۆڕش دژی قوتەیبەیان بلاّو دەکردەوە. بەقوتەیبەیان وت: جگە لەحەیان کەس کاری ئەم خەڵکە بەرەو فیڕۆی ڕێنوێنی ناکات. قوتەیبە مەبەستی ئەوەی کرد بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژێت. حەیان بەنەرمی لەگەڵ نۆکەر و فەرمانبەرانی خۆی هەڵس و کەوتی دەکرد و لەبەر ئەمە ئەوان خۆشیان دەویست. قوتەیبە پیاوێکی بانگ کرد و فەرمانی کوشتنی حەیانی پێدا. یەکێك لەنۆکەران ئەمەی بیست و حەیانی لێ ئاگادار کردەوە. کاتێك نێردراوی قوتەیبە هات و داوای حەیانی کرد، ئەو خۆی نەخۆش خست. خەڵك ڕۆشتنە لای وەکیع و داوایان لێکرد ڕێبەرایەتی ئەوان لەدەست بگرێت. وەکیع ڕازی بو.

لەم کاتەدا لەخوراسان نۆهەزار شەڕکەری خەڵکی بەسرە و خەڵکی عالیەی لێ بو، خەڵکانی بەکر حەوت هەزار شەڕکەر بەسەرکردایەتی حوصەین کوڕی مونزەر، تەمیمیەکان دەهەزار شەڕکەر بەسەرکردایەتی زەرار کوڕی ئەبی حوصەین، خەڵکانی عەبدقەیس چوار هەزار شەڕکەر بەسەرکردایەتی عەبداللە کوڕی عیلوان، لەخەڵکانی ئەزد دەهەزار شەڕکەر بەسەرکردایەتی عەبداللە کوڕی حوزان، لەخەڵکانی کوفە حەوت هەزار شەڕکەر بەسەرکردایەتی جەهم کوڕی ئەبی زەحر، لەموالیەکان حەوت هەزار شەڕکەر بەسەرکردایەتی حەیان کە لەخەڵکانی دەیلەم بو. دەستەیەك دەڵێن: خوراسانی بو و لەبەر ئەمە بەنەبتی بانگیان دەکرد چونکە زمانی دەگیرا. (کۆی هەمویان پەنجا و چوار هەزار شەڕکەر بو).

حەیان کەسی بۆ لای وەکیع رەوانە کرد و وتی: ئەگەر هاوکاری تۆ بکەم، ئایا تا ئەو کاتەی زیندوم و زیندویت، باجی پانتاییەکانی ڕۆژئاوایی روباری بەلخ بەمن دەبەخشیت؟ وتی: بەڵێ. حەیان بەعەجەمەکانی وت: ئەوان لە بێ دینی خۆیان شەڕی یەك دەکەن، وازیان لێ بێنن با یەك کوشتار بکەن. ئەوان ڕازی بون. خەڵك بەنهێنی لەگەڵ وەکیع بەیعەتیان بەست.

بەقوتەیبەیان وت: خەڵك بەنهێنی لەگەڵ وەکیع بەیعەتیان بەستوە. ئەو زەرار

کوڕی سەنانی زەببی وەك سیخوڕی خۆی بۆ ناو هاوەڵانی وەکیع ڕەوانە کرد کە بەنهێنی بەیعەتیان لەگەڵ بەستبو و بەم شێوەیە قوتەیبە لەهەمو ڕوداوەکان ئاگادار بویەوە. لەبەر ئەمە کەسێکی بەدوای وەکیعدا ڕەوانە کرد. نێردراو ئەوی بینی کە پێی خۆی بەرەنگی سور کردوە، چاوبەندێکی خستۆتە سەرچاو و دوپیاو لای ئەو لەسەر قاچی ئەفسون دەنوسن. بەنێردراوی وت: دەبینی کە قاچم چی لێهاتوە. نێردراو گەڕایەوە و ئەم هەواڵەی بەقوتەیبە گەیاند. قوتەیبە ئەوی گەڕاندەوە و وتی: بەهەمان شێوە، سوار ئەسپی بکەن و بیهێنن. وەکیع وتی: ناتوانم. قوتەیبە بەسەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی وت: بڕۆ وەکیع بێنەرە لای من، ئەگەر ڕازی نەبو، بیکوژە. چەندین سواری لەگەڵ ڕەوانە کرد. دەستەیەك دەڵێن: شوعبە کوڕی زوهەیرەی تەمیمی ڕەوانە کرد. وەکیع وتی: ئەی کوڕی زوهەیر، کەمێك بمێنەرەوە تا دەستە شەڕکەرەکان بگەن. وەکیع جل و بەرگی شەڕی پۆشی و هاواری لەخەڵك کرد کە بۆ هاوکاری کردنی لەدەوری کۆبونەوە. سوار ئەسپەکەی خۆی بو و هاتەدەر. پیاوێك پێشی لێگرت. وەکیع وتی: نەژادت لەکێیە؟ وتی: لەبەنی ئەسەد. وەکیع وتی: ناوت چیە؟ وتی: زەرغامە. وەکیع پرسی: باوکت کێیە؟ وتی: لەیس. وەکیع ئاڵاکەی خۆی پێدا. دەستەیەك دەڵێن: ئاڵاکەی لەدەستی عوقەبە کوڕی شەهابی مازنیدا بو. خەڵك دەستە دەستە لەهەمو لایەکەوە لەدەوری کۆبونەوە. پێشڕەوی بەوان کرد و وتی:

قوم اذا حمل مکروهة　　　　شد السراسیف لها و الحزیم

یانی: ڕێزدارێك کە کاتێك کارێکی ناپەسەند ڕوبەری ئەو دەکەنەوە، قۆڵ و کەمەر بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هەڵدەکات.

لەدەوری قوتەیبە کەسان و خزمان و هاوەڵە تایبەتەکانی کۆبونەوە و ئەیاس کوڕی بەیهس کوڕی عەمرۆ کوڕەمامی قوتەیبە لەناویاندا بو. قوتەیبە فەرمانی بەپیاوێك دا کە جاڕیدا: ئای بەنی عامر لەکوێن؟ موحەفەر کوڕی جەزی عەلابی لەخەڵکانی قەیس کە قوتەیبە ئەویشی ڕەنجاندبو، وتی: لەو شوێنەدا بەدوایاندا بگەڕێ کە بۆ ئەوێ دورت خستنەوە. قوتەیبە وتی: بانگیان بکە: لەبەر خوا، لەبەر خزمایەتی! موحەفەر وتی: تۆ پەیوەندی خزمایەتیت پچڕاند. قوتەیبە وتی: بانگیان بکە: داوای لێبوردنتان لێدەکەم. دوبارە موحەفەر وتی: خوا ئێمە نەبەخشیت ئەگەر بتبەخشین. لەم کاتەدا قوتەیبە

وتی:

یا نفس صبرا علی ما کان من الم    اذ لم اجد لفضول العیش اقرانا

یانی: ئەی گیانی من، بۆ ئازارەکەت، خۆڕاگر بە چونکە بۆ روبەروبونەوە لەگەڵ دژواریەکانی ژیان، پشتیوانەکانم نەبینی.

داوای مایینێکی تیژپێی دەستەمۆی کرد و هەوڵیدا سوار بێت بەڵام مایینەکە سەرکێشی کرد تا ئەو جێگەی قوتەیبەی هیلاك و بێزار کرد. کاتێك ئەمەی بینی، بۆ لای تەختەکەی خۆی گەڕایەوە و دانیشت و وتی: بەرەڵایی بکەن، پێشهاتێکە دەبێت رو بدات. حەیانی نەبتی ڕۆشتە لای عەجەمەکان و قوتەیبە هێشتا لەو تورە و لێی رەنجا بو. عەبداللەی برای قوتەیبەی پێی وت: هێرشیان بکەسەر. حەیان وتی: هێشتا کاتی ئەوە نەهاتوە. عەبداللە وتی: کەوانەکەم پێ بدە. وتی: ئەمڕۆ رۆژی تیر و کەوان نیە. حەیان بەکوڕەکەی خۆی وت: کاتێك بینیت من کڵاوەکەی خۆم سوڕاند و بەرەو سوپاکەی وەکیع ڕۆشتم، هاورێ لەگەڵ عەجەمەکانی هاورێت پەیوەستی من ببە.

کاتێك حەیان کڵاوەکەی سوڕاند، عەجەمەکان پەیوەستی سوپاکەی وەکیع بون و تەکبیریان وت. قوتەیبە ساڵحی برای بۆ لای خەڵکەکە رەوانە کرد. پیاوێك لەبەنی زەببە یا بەلعەم تیرێکی بۆ هاویشت کە بەر سەری کەوت. سەری کەوتە سەرشانی و بەهەمان شێوە بردیانە لای قوتەیبە و لەنوێژگە دایاننا. قوتەیبە چەند ساتێك لای ئەو دانیشت.

خەڵکان کۆبونەوە و عەبدولرەحمان برای قوتەیبە روبەرویان بویەوە. خەڵکانێکی زۆری کۆڵان و بازار ئەویان تیرباران کرد و کوشتیان. خەڵك ئاخوڕی وشترەکان و چوارپێکانی قوتەیبەیان سوتاند و لەو نزیك بونەوە. پیاوێك لە باهلە بەرگری لێکرد. قوتەیبە پێی وت: خۆت رزگار بکە. پیاوەکە وتی: ئەگەر ئەو کارە بکەم پیاوێکی پەست و ریسوا دەبم چونکە تۆ خۆراك و پۆشاکی گەرمت بەمن بەخشی و ئێستاکە بەجێت بێڵم. سوپاییەکان نزیك کەوتنەوە و خۆیان گەیاندە خێوەتەکانی و تەنافەکانیان قرتاند. قوتەیبە بەقورسی بریندار بو. جەهم کوڕی زەحر کوڕی قەیس بەسەعدی وت: دابەزە و سەری ببڕە. سەعد دابەزی و خێوەتەکەی دڕاند و سەری قوتەیبەی بڕی. لەگەڵ قوتەیبە عەبدولرەحمان و عەبداللە و ساڵح و حوصەین و عەبدولکەریم و موسلیم و کوڕەکەی کەسیر کوژران. دەستەیەك دەڵێن: عەبدولکەریم لەقەزوێن کوژرا.

ژمارەی خزمەکانی قوتەیبە کە لەگەڵ ئەودا کوژران، پانزە کەس بو. عەمرۆ کوڕی موسلیم برای قوتەیبە رزگاری بو. خاڵەکانی ئەویان رزگار کرد. دایکی غەبرا ءکچی زێرار کوڕی قەعقاع کوڕی مەعبەد کوڕی زورارەی قەیسی بو. کاتێك قوتەیبە کوژرا، وەکیع ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: بەسەرهاتی من و قوتەیبە بەو شێوەیە کە پێشینیان وتویانە:

من ینك العیر ینك نیاکا

یانی: هەرکەس کەڵە کێویەکی نێر بگێت وەك ئەوە وایە گانگەرێکی زۆر گانکەری گابێت.

دوبارە وتی: قوتەیبە دەیویست من بکوژێت بەڵام من پیاوکوژێکم کە خەڵکانێکی زۆر دەکوژم.

قد جربونی ثم جربونی　　　　من غلوتین و من المئین

حتی اذا شبت و شیبونی　　　　خلوا عنانی و تنکبونی

یانی: منیان تاقی کردەوە و تاقیان کردمەوە، لەرێگەی دوجار تیر هاوێشتن و سەدان ئەزمون. کاتێك پیربوم و پیریان کردم، هەوساری ئەسپەکەیان بەرەڵا کردم و بەجێیان هێشتم.

دوبارە وتی: من باوکی موتەریفم. وتی:

انا ابن خندف تنمینی قبائلها　　　　بالصالحات و عمی قیس عیلانا

یانی: من کوڕی خێندەفم کە هۆزەکان من بەکەسێکی چاکەکار دەزانن و مامی من قەیس کوڕی عەیلانە.

دواتر ریشی خۆی گرت و وتی:

شیخ اذا حمل مکروهة　　　　شد الشر اسیف لها و الحزیم

یانی: پیرەپیاوێك کە کاتێك روبەروی کارێکی دژواری دەکەنەوە، بۆ روبەرو بونەوە قۆلی لێ هەڵدەکات.

سوێند بەخوا دەکوژم و کەسانێکی زۆر دەکوژم. لەدار دەدەم و کەسانێکی زۆر لەدار دەدەم. ئەم سنوردارە روسپیەی ئێوە بەهای ئێوەی زیاد کردوە، سوێند بەخوا پەیمانەیەك بۆ چوار درەم دەگەڕێنێتەوە یا لەداری دەدەم! سڵاو بۆ پێغەمبەرەکەتان

بنێرن. دواتر لەسەر تەختی وتاردان هاتە خوار. وەکیع داوای سەر و ئەنگوستیلەکەی قوتەیبەی کرد. خەڵکانی ئەزد هەڵیان گرت. وەکیع بەشمشێری دەرکێشراو هاتەدەر و وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نیە، ناڕۆم تا سەری قوتەیبە تەسلیمی من دەکەن یا سەرم لەدەست دەدەم. حوزەین وتی: ئەی باوکی موتەریف، ئارام بە، سەری قوتەیبە بۆ تۆ دەهێنن. حوزەین ڕۆشتە لای خەڵکانی ئەزد (چونکە سەروەری ئەوان بو) و فەرمانی پێدان سەری قوتەیبە تەسلیمی وەکیع بکەن. ئەوان سەری قوتەیبەیان رادەستی قوتەیبە کرد. وەکیع سەری قوتەیبەی لەگەڵ دەستەیەك کە هیچ پیاوێکی تەمیمی لەناویاندا نەبو، بۆ لای سلێمان کوڕی عەبدولەلیك رەوانەی کرد. وەکیع بەڵێنەکەی لەگەڵ حەیانی نەبتی بردەسەر.

کاتێك کە سەری قوتەیبە و سەری کەس و هاوەڵانیان بردە لای سلێمان، هوزەیل کوڕی زوفەر کوڕی حارس لای ئەو دانیشتبو. وتی: ئەی هوزەیل، ئایا لەم کارە رەنجایت؟ وتی: ئەگەر رەنجابێتم، کەسانێکی زۆر لەگەڵ من ڕەنجاون. سلێمان وتی: داوای ئەوەم نەکرد. سلێمان بۆیە ئەم قسەی بە هوزەیل وت چونکە هوزەیل و قوتەیبە هەردوکیان لەقەیسی عەیلان بون. دواتر فەرمانیدا و سەرەکانیان بەخاك سپارد. کاتێك قوتەیبە کوژرا، پیاوێك لەخوراسانیەکان وتی: ئەی عەرەبەکان! ئێوە قوتەیبەتان کوشت! سوێند بەخوا ئەگەر لەئێمە دەبو و دەمرد، دەمانخستە ناو تابوتێك و لەپیرۆزی ئەو داوای باران و بەختەوەریمان دەکرد. کەس تا ئێستا لەخوراسان وەك قوتەیبە هەڵس و کەوتی نەکردوە، مەگەر ئەوەی پەیمان شکێنی لەگەڵ گەورەی خۆیدا کردبێت. بەسەرهاتەکە بەمشێوە بو کە حەجاج نامەی بۆ قوتەیبە نوسی بو: لەگەڵ ئەوان فێڵ بەکار ببە و لەرێگەی خوادا کوشتاریان بکە.

ئیسپەهبۆد وتی: قوتەیبە کوڕی موسلیم و یەزید کوڕی موهەلیبتان لەناو برد کە دوسەروەری عەرەبەکان بون. پێیان وت: کامیان لای تۆ گەورەتر و خاوەن شکۆتر بو؟ وتی: ئەگەر قوتەیبە لەدورترین کون لەرۆژئاوا زینداندی دەبو و یەزید فەرمانڕەوایەتی ئێمەی دەکرد، شکۆ و مەزنی قوتەیبە لەدڵی ئێمەدا گەورەترە. فەرزدق لەپرسەی قوتەیبەدا وتی:

اتانی و رحلی فی المدینة وقعة       لا ل تمیم اقعدت کل قائم

یانی: من لەمەدینە بوم و باروبنەم لێرەدا بو کەهەواڵێك سەبارەت بەبنەماڵەی تەمیم بەمن گەیشت کە هەرکەسێکی لەجێگەی خۆیدا وشك دەکرد.

عەبدولرەحمان کوڕی جومانەی باهلی لەپرسەی قوتەیبدا وتی:

کان ابا حفض قتیبة لم یسر بجیش الی جیش و لم یعل منبرا

و لم تخفق الرایات و الجیش حوله وقوف و لم یشهد له الناس عسکرا

دعته المنایا فاستجاب لربه و راح الی الجناب عفا مطهرا

فما رزی الاسلام بعد محمد بمثل ابی حفص فبکیه عبهرا

یانی: وەك بڵێی ئەبو حەفص قوتەیبە هەرگیز هێرشی نەکردە سەر سوپایەك و نەڕۆشتە سەرتەختی وتاردان. وەك بڵێی سوپا و ئاڵاکان لەدەوروبەری ئەو نەکەوتنە جووڵە و نەشەکانەوە و خۆڕاگریان نەکرد و خەڵکان زیانی شەڕکەرانی ئەویان نەچێشت. مەرگ ئەوی بانگێشت کرد و ئەو وەڵامی بانگەوازەکەی خوای خۆی دایەوە و پاك و پاکیزە بەرەو بەهەشت ڕۆشت. دوای محەممەد، داغێکی بەم گەورەییە لەئیسلامدا نەبینراوە، کەواتە ئەی عەبهەر، بۆ ئەو لەجیاتی فرمێسك، خوێن و گەوهەر ببارێنە.

عەبهەر کەنیزێکی (دایکی مناڵ) قوتەیبە بو. پیرانی غەسان وتیان: لەتەپۆڵکەی (لاشخۆر) بوین کە پیاوێکمان بەداردەستێك و هەمانەیەکەوە بینی. وتمان: لەکوێوە دێیت؟ وتی: لەخوراسان. وتمان: هیچ هەواڵێکی تازەت پێیە؟ وتی: بەڵێ، دوێنێ قوتەیبە کوڕی موسلیم کوژرا. لەوتەکانی ئەو سەرمان سوڕما. کاتێك زانی ئێمە باوەڕی پێناکەین، وتی: چی دەڵێن ئەگەر ئەمشەو من لەئەفریقیە ببینن؟ لەئێمە دورکەوتەوە و بەرێگەی خۆیدا ڕۆشت. بەئەسپەکانمان شوێنی کەوتین کەپێش تیشکی چاو دەکەتەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

دەستەیەك دەڵێن: لەمانگی صەفەری ئەم ساڵە، ئۆکتۆبەری ٧١٤ زایینی یا ساڵی ٩٥/ ٧١٣- ٧١٤ (لەو مانگەی کە حەجاج تیایدا مرد) قورە کوڕی شەریکی عەبسی فەرمانداری میسریش مرد.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم فەرمانداری مەدینە، ئاینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید فەرمانداری مەککە بو، یەزید کوڕی موهەلیب فەرمانداری جەنگ و نوێژ بو لەعێراق، ساڵح کوڕی عەبدولرەحمان سەرپەرەستی کۆکردنەوەی باج، سوفیان کوڕی عەبداللە کەندی کارگوزاری یەزید کوڕی موهەلیب بو لەبەسرە، عەبدولرەحمان کوڕی ئۆزەینە سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە، ئەبوبەکر کوڕی ئەبی موسا سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە و وەکیع کوڕی ئەبی ئەسوەد فەرماندەی کاروباری تایبەت بەجەنگ لەخوراسان بو.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: شورەیحی قازی لەتەمەنی ١٢٠ ساڵی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٩٧/ ٧١٥- ٧١٦ زایینی کۆچی دوایی کرد. عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکرە، مەحمود کوڕی لوبەیدی ئەنساری لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)، عەبداللە کوڕی مۆحەیرێز لەکاتی فەرمانڕەوایی وەلید و دەستەیەك دەڵێن: ئەو چاوی بە پێغەمبەر کەوتبو، ئەبو سەعیدی مەقبەری کە لەگۆڕستانەکان ژیانی بەسەر دەبرد و بەو ناوە بانگ دەکرا، ئیبراهیم کوڕی یەزیدی نەخەعی فەقیە، ئیبراهیم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەتەمەنی ٧٥ ساڵی، عەبداللە کوڕی عومەر کوڕی عوسمان کوڕی عەفان لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك، محەممەد کوڕی ئوسامە کوڕی زەید کوڕی حارسە، عەباس کوڕی سەهل کوڕی سەعدی ساعدی.

## رووداوەكانی ساڵی نەوەد و حەوتی كۆچی ( ٧١٥- ٧١٦ زایینی )

## كوژرانی عەبدولعەزیز كوڕی موسا كوڕی نوصەیر

هۆكاری كوژرانەكەی ئەوە بو كە باوكی ئەوی كردە فەرمانڕەوای ئەندۆلۆس. پێشتر ئاماژەمان بەم بابەتەدا كە لەكاتی گەڕانەوە ئەو لەشام بو. ئەو ئەم سەرزەمینەی سەقامگیر كرد و كاروبارەكانی هەڵسوڕاند و پارێزگاری لەسنورەكان كرد و لەكاتی فەرمانڕەوایی خۆی دەستی بەسەر چەندین شاردا گرت كە دوای باوكی هێشتا دەستیان بەسەردا نەگیرا بو. پیاوێكی چاكەخواز و ڕێزدار بو. ئەو ژنی ڕێدریك (رزریقی) كردە هاوسەری خۆی و ئەم ژنە جێگەیەكی تایبەتی لەدڵی ئەو دا كردەوە و لەخۆشەویستی ئەو كەڵكی وەرگرت. ژن بەسەریدا زاڵبو و ناچاری كرد فەرمان بەهاوەڵان و خەڵكانی وڵاتەكەی خۆی بدات تا سوجدەی بۆ ببەن و هەركاتێك دەڕۆنە لای (بەهەمان شێوە كە بۆ هاوسەری پێشوتری ئەو كارەیان دەكرد) كوڕنوشی بۆ ببەن. پیاو بەژنەكەی وت: ئەمە لەئائینی ئێمەدا نیە. ژن ئەوەندەی لەگەڵ وت تا سەرئەنجام فەرمانیدا لەو شوێنەی تیایدا كۆدەبویەوە، دەلاقەیەك دروست بكەن. كاتێك یەكێك دەهاتە ناو، بەناچاری وەك كەسێك كەكوڕنوش ببات، سەری دادەنەواند وەك بڵێی سوجدەی بۆ دەبات. ژن بەوە ڕازی بو. ژن كەبە مەبەستەكەی خۆی گەشتبو، پێی وت: ئێستا بویتە یەكێك لەپاشاكان، تەنیا ئەوە ماوە لەو زێر و خشڵانەی لای منە، تاجێكت بۆ دروست بكەم و بیكەمە سەرت. عەبدولعەزیز ڕازی نەبو. ژن پێداگری كرد تا ئەو كارەی كرد. ئەم كارە بۆ موسوڵمانەكان ئاشكرا بو بەشێوەیەك كەوتیان: ئەو باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێناوە. هەستیان بەنهێنی دەلاقەكەیش كرد و دژی ئەو ڕاپەرین و لەكۆتایی ساڵی ٩٧/ ٧١٦ زایینی ئەویان كوشت. دەستەیەك دەڵێن: سلێمان كوڕی عەبدولعەزیز لەباوكی موسا كوڕی نوصەیر توڕە بو و پەیامی بۆ سوپاكەی عەبدولعەزیز ڕەوانە كرد تا بیكوژن. ئەوان لەكاتێكدا كەنوێژی بەیانی دەخوێند و سوری فاتیحە و واقیعەی دەخوێندەوە، هێرشیان كردە سەر و بەشمشێرەكانی خۆیان سەریان بڕی و بۆ لای سلێمان

ڕەوانەیان کرد. سلێمان ئەوەی بەباوکی نیشاندا و باوکی پیاوانە لەبەرابەر ئەم کارە خۆڕاگری کرد و وتی: گیان بەخشینی لێ پیرۆز بێت، سوێند بەخوا پیاوێکتان کوشت کە شەوی بەنوێژ خوێندن بەسەر دەبرد و ڕۆژەکان بەڕۆژو دەبو. ئەم کارەیان بەهەڵەیەکی سلێمان لەقەڵەمدا. لەسەر بنەمای ئەم گێڕانەوەیە، کوژرانی ئەو لەکۆتایی ساڵی ٩٨/ ٧١٧ زایینی ڕویدا.

سلێمان، حوڕ کوڕی عەبدولرەحمانی سەقەفی وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس دەستنیشان کرد کە فەرمانڕەوایی ئەو سەرزەمینەی کرد تاکاتی هاتنە سەرکاری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کەئەوی لەسەر کار لابرد. ئەمە کۆتایی ئەو باسە بو کە دەمانویست بەشێوەیەکی چڕوپڕ سەبارەت بەکوژرانی عەبدولعەزیز ئاماژەی پێ بدەین.

هەروەها لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی عەبدولەلیك، عەبدالله کوڕی موسا کوڕی نوصەیری لەفەرمانداری ئەفریقیە دورخستەوە و محەممەد کوڕی یەزیدی قورەشی لەجێگەکەی ئەودانا. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەجیاتی ئەو لەساڵێ ١٠٠/ ٧١٨- ٧١٩ زایینی ئیسماعیل کوڕی عەبداللەی هێنایە سەرکار. ئەو پیاوێکی چاکەکار بو و هەمو بەربەرییەکان لەرۆژگاری ئەو باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

## فەرمانداری یەزید کوڕی موهەلیب لەخوراسان

هۆکاری ئەم کارە بەو شێوە بو کاتێك سلێمان کوڕی عەبدولەلیك، یەزیدی کردە فەرمانڕەوایی عێراق، کاروبارەکانی تایبەت بەجەنگ و نوێژ و باجی بەو سپارد. یەزید بەخۆی وت: حەجاج عێراقی وێران کردوە و من ئەمڕۆ دەسەڵاتداری عێراقم. هەرکاتێك بگەمە ئەو سەرزەمینە، لەسەر وەرگرتنی باج خەڵکان ئەشکەنجە و بەزۆر لێیان دەستێنم و هاوشێوەی حەجاج زیندانەکان لەوان پڕدەکەم و ئەوەی خوا بۆ ئاسوودەی پێی بەخشیون، لێیان وەردەگرمەوە و ئەگەر هاوشێوەی حەجاج زێڕ و گەوهەر بەسلێمان کوڕی عەبدولەلیك نەدەم، لەمن ڕازی نابێت. یەزید ڕۆشتە لای سلێمان و وتی: ئایا پیاوێکت پێ بناسێنم کەشارەزایی کاروباری تایبەت بەباج کۆکردنەوەیە تا بۆ ئەو کارە ڕایسپێریت؟ وتی: بەڵێ. وتی: ساڵح کوڕی عەبدولرەحمان لەموالیەکانی بەنی تەمیم. سلێمان بۆ ئەو کارە ڕایسپارد و پێش یەزید ئەوی ڕەوانە کرد. ئەو لەواست دابەزی و یەزید ڕوی لەو دیارە کرد. خەڵکان هاتنەدەر و پێشوازیان لێکرد. ساڵح

بەعایایەکی فش و گەورە هاتەدەر و لەپێش خۆیەوە چوارسەد پیاو لەخەڵکانی شامی ڕەوانە کرد و چاوی بەیەزید کەوت. یەزید دابەزی. ساڵح کاروبارەکانی لەو دژوار کرد. یەزید هەزار سفرەی ڕاخست کەخواردنی بەخەڵك دەدا. ساڵح ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت. یەزید وتی: بەهاکەی بۆ من بنوسە. یەزید کاڵایەکی کری و قەواڵەیەکی لەبەرابەر بەهاکەی بۆ ساڵح نوسی. ساڵح بەقەواڵەکە ڕازی نەبو و وتی: باجەکان بەشی ئەم کارانەی تۆ ناکات و سەروەری باوەڕداران ڕازی نابێت و لەسەر ئەم کارە تۆ دەخرێتە زیندان. یەزید پێکەنی و وتی: ئەم جارە ئەم بڕە پارە بدە و دڵنیا بە جارێکی دیکە ئەو کارە دوبارە ناکەمەوە. ساڵح ئەو کارەی کرد.

سلێمان خوراسانی پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایەتی یەزید نەکردبو. یەزید لەعێراق بێزار بو چونکە ساڵح کاروبارەکانی لەو دژوار کرد. ئەو عەبداللە کوڕی ئەهتەمی بانگ کرد و وتی: دەمەوێت لەکارێکدا راوێژت پێ بکەم کە منی نیگەران کردوە و حەز دەکەم ئەو کارە بۆ من ئەنجام بدەیت. وتی: ئەنجامی دەدەم. وتی: بەهەمان شێوە کەدەبینیت، لەتەنگانەدام ولەم کارە بێزاربوم و خوراسان پیاوێکی شارەزا و بەئەزمونی لێ نیە، ئایا هیچ ڕێگە چارەیەك دەبینیت؟ وتی: بەڵێ. من بۆ لای سەروەری باوەڕداران ڕەوانە بکە. وتی: ئەوەی لەگەڵ تۆدا باسم کرد، نهێنی بێت. نامەی بۆ سلێمان کوڕی عەبدولەلیك نوسی و ئەوی لەکاروبارەکانی عێراق ئاگادار کردەوە و وەسفی کوڕی ئەهتەمی کرد کەپیاوێکی شارەزا و ئاگایە. کوڕی ئەهتەمی لەگەڵ پەیکەکەی بۆ شام ڕەوانە کرد. کوڕی ئەهتەم ڕۆشتە لای سلێمان و لەگەڵ ئەو کۆبویەوە. سلێمان وتی: یەزید نامەی بۆ نوسیوم و ئاگاداری کردومەتەوە کە شارەزایی کاروبارەکانی تایبەت بەعێراق و خوراسانیت، سەبارەت بەوسەرزەمینانە چی دەزانیت؟ وتی: شارەزاترین کەس بۆ ئەو سەرزەمینەم، لەوێ لەدایك بوم و لەوێ گەورە بوم و بەتەواوی شارەزایی هەڵس و کەوت جۆنیەتی بیرکردنەوەی خەڵکەکەییم. وتی: پیاوێك دەستنیشان بکە تا بیکەمە فەرمانڕەوایی خوراسان. وتی: سەروەر باوەڕداران باشتر دەزانێت چ کەسێك بکاتە فەرمانڕەوا، ئەگەر ناوی کەسێك ببات، بۆچونی خۆمی پێ دەڵێم. سلێمان ئاماژەی بەپیاوێك لەقورەیش دا و کوڕی ئەهتەم وتی: لەپیاوانی خوراسان نیە. سلێمان وتی: عەبدولەلیك کوڕی موهەلیب. عەبداللە کوڕی ئەهتەم وتی: شیاو نیە و پشت لەو

کارە دەکات چونکە نەدەتوانێت وەك باوکی فێڵ و فریو بەکار ببات و نەوەك براکەی بوێر و ئازایە. ئەو ئاماژەی بەچەندین کەس دا و لەکۆتاییدا ناوی وەکیع کوڕی ئەبی ئەسوەدی هێنایە سەرزمان. کوڕی ئەهتەم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، وەکیع پیاوێکی بوێر، سەروەری و پێشڕەوە و هیچ کەسێك بۆ سوپاسی من و ئەو بەخششانەی بەمنی بەخشیوە، شیاوتر لەو نیە چونکە دادی دڵی منی وەرگرت و تۆڵەی لەدوژمنەکەم سەند بەڵام سەروەری باوەڕداران مافێکی گەورەتری لەملی مندایە و چاکەخوازی بۆ ئەو لەپێشتر لەهەر کارێکە. وەکیع بەوشێوەیە کە هەرکاتێك سەد سوارەی لەژێر فەرمانی خۆیدا ببینیبێت، شۆڕشی دەست پێکردوە، لەناو خەڵکان کەسێکی نەناسراوە وبەردەوام بۆ ئاژاوە نانەوە ئامادەیە. سلێمان وتی: هاوار لەتۆ، چ کەسێك پێشنیار دەکەیت؟ کوڕی ئەهتەم وتی: پیاوێك کە من دەیناسم و سەروەری باوەڕداران ناوی نەبرد. وتی: کێیە؟ وتی: ناوی نابەم تا ئەوەی سەروەری باوەڕداران بەڵێن بدات ئەمە بەنهێنی بهێڵێتەوە و ئەگەر لەم کارە ئاگادار بویەوە، پارێزگاری لەگیانی من بکات. سلێمان وتی: بەڵێن دەدەم. کوڕی ئەهتەم وتی: یەزید کوڕی موهەلیب. سلێمان وتی: ئەو عێراقی زیاتر لەخوراسان خۆش دەوێت. کوڕی ئەهتەم وتی: دەزانم بەڵام باشترە ناچاری بکەیت لەعێراق جێگرێك بۆ خۆی دەستنیشان بکات و بەرەو خوراسان بەرێکەوێت. سلێمان وتی: بۆچونی راستت بەمن وت. فەرمانی بۆ یەزید نوسی و ئەوی کردە فەرمانڕەوایی خوراسان و فەرمانەکەی بە کوڕی ئەهتەمدا رەوانە کرد. کوڕی ئەهتەم ڕۆشتە لای یەزید و فەرمانی پێدا هەمان رۆژ بۆ بەرێکەوتن ئامادە بێت. یەزید هەمان رۆژ کوڕەکەی خۆی موخەلیدی بۆ خوراسان رەوانە کرد و خۆی دوای ئەو بەرێکەوت. جەراح کوڕی عەبدالله حەکەمی وەك فەرمانداری واست و عەبدالله کوڕی هیلالی کەلابی وەك فەرمانداری بەسرە و براکەی مەروان کوڕی موهەلیبی بۆ کار و نیازەکانی خۆی لەم شارە (چونکە زیاتر لەهەمو براکانی بڕوای بەو بو) و حەرمەلە کوڕی عومەیری لەخمی وەك فەرمانداری کوفە دەستنشیان کرد کە بۆ ماوەی چەند مانگێك لەسەر کارەکەی مایەوە و دواتر ئەوی لابرد و بەشیری کوڕی حەیانی نەهدی کردە فەرمانداری کوفە. خەڵکی قەیس گومانیان دەکرد قوتەیبە دژی خەلیفە شۆڕشی نەکردوە. لەبەر ئەمە کاتێك یەزید بەرەو خوراسان بەرێدەکەوت، سلێمان فەرمانی پێدا سەبارەت بەقوتەیبە پرسیار بکات. ئەگەر

قەیسیەکان شایەتیان دا کە قوتەیبە شۆڕشی نەکردوە، وەکیع بەتاوانی کوشتنی ئەو زیندانی بکات. کاتێك موخەلید کوڕی یەزید گەیشتە مەرو، ئەوی گرت و خستیە زیندان و هاورێکانی ئەشکەنجە کرد. ئەم کارانەی پێش گەیشتنی باوکی ئەنجامدا. فەرمانڕەوایی وەکیع لەخوراسان دە یا نۆ مانگی خایاند. دواتر یەزید لەم ساڵەدا گەیشت و لەخوراسان دابەزی. ئەو خەڵکانی شام و خوراسانیەکانی لەخۆی نزیك کردەوە. نەهار کوڕی تەوسعە لەمبارە وتی:

| | |
|---|---|
| و ما کنا نؤمل من امیر | کما کنا نؤمل من یزید |
| فاخطا ظننا فیه و قدما | زهدنا فی معاشرة الزهید |
| اذا لم یعطنا نصفا امیر | مشینا نحوه مشی الاسود |
| فمهلا یا یزید انب الینا | و دعنا من معاشرة العبید |
| نجی و لانری الا صدودا | علی انا نسلم من بعید |
| و نرجع حائبین بلا نوال | فما بال التهجم و السدود |

یانی: ئەوەی لەیەزید هیوادار بوین، لەهیچ فەرمانڕەوایەکی دیکە چاوەڕێمان نەدەکرد. بەڵام گومانەکەی ئێمە سەبارەت بەو راست نەبو و ئێمە لەکۆنەوە پێکەوە ژیان لەگەڵ خەڵکانی سەرکۆنە کراو و پەستمان بەناخۆش زانیوە. ئەگەر فەرماندارەکەمان داد و ماق ئێمە نەدات، هاوشێوەی شێرانی ژیان دژی ئەو رادەپەڕین. ئاگادار بە و لەشوێنەکەی خۆتبە، یەزید و داوای لێبوردن لەئێمە بکە و ئێمە لەهاوەڵی لەگەڵ کۆیلەکان دوربخەرەوە. بەرەو لای تۆ دێین بەڵام رێگاکان داخراون و لەدورەوە سلاوت بۆ دەنێرین بەڵام بێ وەرگرتنی بەخشش دەگەڕێینەوە. ئەم ستەم و هێرش بردن و رێگرتنە بۆ چیە؟

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی عەبدولەلیك سوپایەکی بۆ شەڕ لەکۆنستانتین نۆپێل و کوڕەکەی داوودی بۆ شەڕی هاوینە رەوانە کرد کەدەستی بەسەر قەلاّی (زن)دا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا مەسلەمە لەسەرزەمینی وەزاحیە شەڕی کرد و دەستی بەسەر قەلاّیەکدا گرت کە وەزاح پاشای وەزاحیە بناغەی بۆ داڕشتبو.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی هوبەیرە لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و لەدەریاوە هێرشی برد و زستانی لەو ناوچەیە گوزەراند.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی عەبدولەلیك ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

داوود کوڕی تەڵحەی حەزرەمی لەم ساڵەدا لەفەرمانداری مەککە دورخرایەوە. ماوەی فەرمانداری ئەو لەم شارە شەش مانگی خایاند و لەجێگەی ئەو عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید هاتە سەرکار. فەرمانداری شارەکان ئەو کەسانە بون کە پێشتر ئاماژەمان پێدان.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەتا ءکوڕی یەسار کەدەستەیەك وتویانە: لەساڵی ١٠٣/ ٧٢١ زایینی مرد، موسا کوڕی نوصەیر کەدەستی بەسەر ئاندۆلۆسدا گرت و مەرگی ئەو لەرێگەدا روویدا، قەیس کوڕی ئەبی حازمی بەجلی کەزیاتر لەسەد ساڵ ژیا و کاتێك رۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) کەکۆچی دوایی کردبو و حەدیسی لەدەکەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) گێڕاوەتەوە، دەستەیەك دەڵێن: حەدیسی لە عەبدولرەحمان کوڕی عەوف نەگێڕاوەتەوە ( ئەو دەکەسە ئەوانە بون کە مژدەی بەهەشتیان پێ بەخشرابو). لەکۆتایی ژیانی ئاوزی لەدەستدا. سالم کوڕی ئەبی جەعد لەموالیەکانی بنەماڵەی ئەشجەع. ناوی ئەشجەع رافیعە.

## ڕوداوەکانی ساڵی نەوەد و هەشتی کۆچی ( ٧١٦- ٧١٧ زایینی )

## گەمارۆ خستنە سەر کۆنستانتین نۆپێل و ( قوستەنتینە )

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك بەرەو دابق بەڕێکەوت و سوپایەکی بەسەرکردایەتی براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك کۆکردەوە تا بەرەو کۆنستانتین نۆپێل بەڕێبکەوێت. لەم کاتەدا پاشای ڕۆم مرد و ئەلیون لەئازەربایەجانەوە هاتە لای و لەم هەواڵە ئاگاداری کردەوە و بەڵێنیدا دەرگای ڕۆم بەروی ئەودا بکاتەوە. سلێمان مەسلەمەی لەگەڵ ئەودا ڕەوانە کرد. ئەم دوانە بەرەو کۆنستانتین نۆپێل بەڕێکەوتن و کاتێك لێی نزیك کەوتنەوە، مەسلەمە فەرمانی بەسوارەکان دەدا دو پەیمانە خۆراك بەدوای ئەسپەکانی خۆیانەوە ببەستن تا دەگەنە کۆنستانتین نۆپێل. ئەو کارەیان کرد. کاتێك گەیشتنە ئەو شارە، فەرمانیدا خۆراکەکان بڕێژن کە سوارەکان لەیەك شوێندا ڕۆیان کرد و تەپۆڵکەیەکی هاوشێوەی کێویان دروست کرد. بەموسوڵمانانی وت: لەم خۆراکە مەخۆن و هێرش بکەنە قوڵایی سەرزەمینەکەی ئەوان و کشتوکاڵ بکەن. ئەو ماڵە دارینەکانی دورست کرد وزستان و هاوینی لەوێ بەسەر برد و خەڵکان زەویەکانیان کێلا و ئەو خۆراکە لەبیاباندا مایەوە و خەڵك لەبەرهەمی کشتوکاڵی خۆیان و تاڵانیە بەدەست هاتوەکانی خۆیان ڕۆژیان دەخوارد و لەوەی بەدەستیان دەهێنا ڕۆژیان هەڵدەگرت. مەسلەمە وەك کەسێکی سەرکەوتو لەڕۆم مایەوە وگەورەکانی خەڵك وەك خالید کوڕی مەعدان و موجاهید کوڕی جەبر و عەبداللە کوڕی زەکەریای خوزاعی هاوڕێیەتیان دەکرد.

ڕۆمیەکان کەسیان بۆ لای مەسلەمە ڕەوانە کرد و پێشنیاریان کرد بۆ هەر کەسێك دینارێك بدەن بەڵام ئەو ڕازی نەبو. ڕۆمیەکان بەئەلیونیان وت: ئەگەر موسوڵمانان لەوڵاتەکەی ئێمە دوربخەیتەوە، تۆدەکەین بەپاشای خۆمان. ئەلیون بەڵێنی لەوان وەرگرت و دوای هاتە لای مەسلەمە و پێی وت: ڕۆمیەکان دەزانن کە لەگیان و دڵەوە شەڕ لەگەڵ ئەوان ناکەیت و تا ئەو کاتەی خۆراکت هەیە، درێژە بەگەمارۆکەت دەدەیت. ئەگەر خۆراکەکانی خۆت بسوتێنیت، ملکەچی فەرمانەکانی تۆ دەبن. مەسلەمە فەرمانی

سوتاندنی خۆراکەکانیدا و رۆمیەکان بەم کارە بەهێز بون و کاروبارەکان بەشێوەیەك لەموسوڵمانان دژوار بو کە هەمویان لەمردن نزیك بونەوە. ئەمە بەردەوام بو تا ئەو کاتەی سلێمان مرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەلیون ئەم فێڵەی لەمەسلەمە کرد و پێشنیاری پێکرد تەنیا بەئەندازەی یەك شەو خواردن ببەنە ناو رۆم تا خەڵکانی رۆم ئەو بەراستگۆ بزانن چونکە فەرمانی ئەو و فەرمانی موسلیمە یەکێکە و ئەوان ئەمانیان هەیە لەولاتەکەی خۆیان بێنەدەر و ئەسیری نەکرێن. مەسلەمە فەرمانیدا. ئەلیون کەشتی و پیاوەکانی ئامادە کردبو کە لەو شەوەدا خورادنەکەیان برد و لەو سەرزەمین و بێستانانە شتێکی بەرچاویان نەهێشتەوە. ئەلیون بو بەکەسێکی دوژمن و خیانەتکار. بەشێوەیەك فێڵی لێکرا کەئەگەر ژنێك دەبو، سەرکۆنەیان دەکرد. سوپاییەکان کەوتنە رەنجێکی فراوانەوە بەشێوەیەك هیچ سوپایەك پێشتر روبەروی ئەم پێشهاتە نەبوبویەوە. تەنانەت سوارەکان دەترسان بەتەنیا لەناو لەشکرگەکەیان بێنەدەر. چوارپێکان و پێست و گەلای دارەکان و پێستی گیانداران و هەر شتێکی دیکەیان دەکردە خواردنی خۆیان. سلێمان لەدابق بو. زستان گەیشت و نەیتوانی هاوکاری ئەو سوپایە بکات تا مرد.

## درێژەی روداوەکان

لەم ساڵەدا سلێمان بۆ ئەیوبی کوری وەك جێنشینی خۆی لەخەڵك بەیعەتی وەرگرت بەڵام کورەکەی پێش خۆی مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا شاری صەقالیە (ئێسلاوان) دەستی بەسەردا گیرا. خەڵکی بورجان هێرشیان کردە سەر مەسلەمە کوری عەبدولمەلیك و سوپاکەی ئەو ژمارەیان کەم بو. لەبەر ئەمە، بۆ سلێمان کوری عەبدولمەلیك نامەی نوسی و داوای هاوکاری کرد کە پێی گەیشت. ئیسلاوەکان فێڵیان کرد و هەلاتن.

هەروەها لەم ساڵەدا وەلید کوری هشام و عەمرۆ کوری قەیس بۆ شەر بەرێکەوتن و کەسانێك لەخەڵکی ئەنتاکیەیان کوشتار و ئەسیرکرد و وەلید کەسانێکی لەخەڵکانی نزیك رۆم وەك ئەسیر لەگەڵ خۆیدا هێنا.

## گرتنی جەرجان و تەبەرستان

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی موهەلیب، دوای هاتنی بۆ خوراسان، لەجەرجان و تەبەرستان شەڕی کرد.

هۆکاری ڕۆشتنی بۆ شەڕ لەم دو شارە و گرنگیدان پێیان، ئەوە بو کاتێك لەشام لای سلێمان ژیانی بەسەر دەبرد، هەرجار قوتەیبە دەستی بەسەر سەرزەمینێکدا دەگرت، بە یەزیدی دەوت: نابینی خواوەند لەسەر دەستی قوتەیبە چۆن دەرگای شارەکانمان بۆ دەکاتەوە؟ یەزید دەیوت: لەجەرجان چی کرد؟ ئەو شارەیە ڕێگەی بەستوە و قومس و نەیشابوری بەفیرۆداوە. دوبارە دەیوت: ئەم وڵات گرتنانە گرنگیان نیە دەبێت دەست بەسەر جەرجاندا بگیرێت.

کاتێك سلێمان ئەوی کردە فەرمانڕەوایی خوراسان، زیاتر ئارەزومەندی گرتنی جەرجان بو. ئەو هاورێ لەگەڵ سەد هەزار شەرکەر لەخەڵکانی شام و عێراق و خوراسان مەبەستی ئەو سەرزەمینەی کرد. ئەم سەد هەزار کەسە جیاواز لەموالیەکان و خۆبەخشەکان بون. جەرجان هێشتا بەتەواوی نەببو بەشار، پانتاییەك لەکێو و دۆڵ و دەربەند و ڕێگە باریك و دژوارەکان بو کە پیاوێك لەدەروازەکەی دەوەستا وکەس نەیدەتوانی بڕواتە ناوی. ئەو لەکەهستانەوە (قەهستان) دەستی پێکرد و گەمارۆی خستەسەر. خەڵکەکەی تورك بون. گەمارۆی خستە سەریان. خەڵکەکەی دەهاتنەدەر و شەڕیان دەکرد و بەردەوام شکستیان بەموسوڵمانان دەهێنا. ئەگەر شکستیان دەخوارد پەنایان بۆ قەلاکەیان دەبرد. ڕۆژێك هاتنەدەر و موسوڵمانان ڕوبەڕویان بونەوە و شەرێکی قورسیان دەستپێکرد. محەممەد کوڕی ئەبی سەبرە هێرشی کردە سەر پیاوێکی تورك ئەژاد کە ڕێگەی پێشڕەوی موسوڵمانانی گرتبو. دو زەربەیان لەیەکدا و شمشێری تورکەکە لەخودەکەی محەممەد گیری کرد. کوڕی ئەبی سەبرە ئەوی گرت و کوشتی و گەڕایەوە و خوێن لەشمشێرەکەی دەچۆڕی و شمشێری تورکەکە بەهەمان شێوە بەخودەکەیەوە بو. خەڵك دیمەنێکی جوان و دلگیریان بینی.

دوای ئەوە، ڕۆژێك یەزید هاتەدەر و بۆ شوێنێك گەڕا تا لەوێوە هێرشیان بکاتە سەر. چوارسەد پیاوی شەڕکەر لەگەورەکان و سەرانی خەڵك هاورێیەتیان دەکرد. نەکەوتبونەخۆ کە تورکەکان بەچوار هەزار پیاوی شەڕکەر هێرشیان کردنەسەر. شەڕیان

دەست پێکرد و یەزید ئازایانە شەڕی دەکرد. شەڕکەران گەڕانەوە. ئەوان تینویان ببو و لەبەر ئەمە بۆ کانیاوەکە گەڕانەوە و ئاویان خواردەوە و دوژمنان پاشەکشێیان کرد.

دواتر یەزید بۆ شەڕ دژی ئەوان پێداگری کرد و هۆکارەکانی بژێوی لەوان گرتوە بەشێوەیەك بەتەواوی لاواز و ناتەوان ببون. صول فەرمانداری کەهستان کەسی بۆ لای یەزید رەوانە کرد و خوازیاری ئاشتی بو لەسەر بنەمای ئەوەی بەخۆی و کەسانی بنەماڵەکەی ئەمان ببەخشێت و سامانەکەی بۆ خۆی بێت تا شارەکەیان تەسلیم بکات. یەزید ئاشتی لەگەڵ کرد و بەڵێنەکەی بردەسەر و ڕۆشتە ناو شارەکە و سامان و گەنج و ئەسیری زۆری گرت. چواردە هەزار تورکی بەئەشکەنجە کوشت و نامەی بۆ سلێمان کوڕی عەبدولەلیك نوسی و لەکارەکان ئاگاداری کردەوە.

دواتر بەرەو جەرجان بەڕێکەوتن. پێشتر خەڵکەکەی لەگەڵ سەعید کوڕی عاص پەیمانی ئاشتیان بەستبو و لەسەر ئەم پەیمانی ئاشتیە باجیان دەدا بەو شێوەی کە هەندێ کات سەد هەزار و هەندێ کات دوسەد هەزار و هەندێ کات سێسەد هەزاریان دەدا(دینار یا درەم؟). هەندێ کات باجیان دەدا و هەندێ کات نا. ئەوان پەیمانەکەیان شکاند و شارەکەی خۆیان بەهێز کرد و باجیان نەدا. دوای سەعید کەس روی لەو ناوچەیە نەکرد و جەرجانیەکان رێگاکانیان بەست. خەڵکان هەمو تەنیا لەرێگەی فارس و کرمانەوە رێگەی خوراسانیان دەگرتە بەر. یەکەم کەس کە رێگەی قومسی تەخت و سازگار کرد، قوتەیبە کوڕی موسلیم لەکاتی فەرمانڕەوایی کردنی خوراسان بو. بەو شێوە مایەوە تا یەزید بوبە فەرمانڕەوایی خوراسان و خەڵکانی جەرجان بەئاشتی پێشوازی و باجیان زیاد کرد. بەمە رازی بوو و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن.

کاتێك کەهستان و جەرجان دەستی بەسەردا گیرا، چاوی تەماحی لەتەبەرستان بڕی و ئارەزوی گرتنی ئەو شارەی کرد و بڕیاریدا بۆ گرتنی ئەو شارە بەڕێکەوێت. عەبدالله کوڕی موعەمەری یەشکری وەك کارگوزاری خۆی لەساسان و کەهستان دەستنیشان کرد و روی کردە خوارەوەی جەرجان لەنزیکی تەبەرستان و راشد کوڕی عەمرۆی لەگەڵ چوارهەزار کەس لەئیزوسا بەجێهێشت و ڕۆشتە ناو سەرزەمینەکانی تەبەرستان. پاشاکەی، ئیسپەهبۆد، کەسی رەوانە کرد و داوای ئاشتی کرد لەسەر ئەو بنەمای کەیەزید لەتەبەرستان بڕواتەدەر. یەزید رازی نەبو و هیوادار بو بتوانێت دەست بەسەر ئەو

شارەدا بگرێت. براکەی ئوبو عۆیەیینە لە قۆڵێکەوە و کوڕەکەی خۆی خالید کوڕی یەزیدی لەقۆڵێکی دیکەوە و ئەبو جەهمی کەلبی لەقۆڵێکیترەوە رەوانە کرد. وتی: کاتێك بەیەك گەیشتن، ئەبو عۆیەیینە سەرکردەی هەموان بێت. ئەبو عۆیەیینە بەرێکەوت و یەزید ئوردوی لێدا.

ئیسپەهبۆد، گیلانیەکان و دەیلەمیەکانی هەڵخڕاند کە لەدەوری ئەو و لەسەر بەرزایی کێوێك کۆبونەوە. بتپەرستەکان لەکێوەکەدا شکستیان خوارد و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن تا گەشتنە دەروازەی دۆڵەکە. موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو دۆڵەکە و بتپەرستەکان ڕۆشتنە سەرکێوەکە و موسوڵمانان مەبەستی بەرزاییەکانیان کرد کە بارانی بەرد و تیریان بەسەردا باراندن. ئەبو عۆیەیینە شکستی خوارد و موسوڵمانان هەڵاتن و سوار کۆڵی یەك دەبون و لەبەرزایی کێوەکە سەرەوخوار دەبونەوە تا گەشتنە ئوردوگاکەی یەزید کوڕی موهەلیب. دوژمنان شوێنیان نەکەوتن و ئیسپەهبۆد لەوان ترسا. خەڵکانی جەرجان و سەرکردەکەیان، مەرزبان، داوایان لێکردن تا هێرش بکەنە سەر موسوڵمانان و هۆکارەکانی ژیان لەیەزید بگرنەوە و رێگەی ئەو لەگەڵ سەرزەمینە ئیسلامیەکان ببەستن. بۆ ئەم کارە مژدەی پاداشت و بەخششیان پێدەدان. ئەوان بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان و کوشتاریان کردن چونکە ئەو شەوە ئاگا بون. عەبدالله کوڕی مەعمەر و هاورێکانی هەمویان کوژران بەشێوەیەك کەس لەوان رزگاری نەبو. نامەیان بۆ ئیسپەهبۆد نوسی تا رێگەکان و دۆڵەکان ببەستێت.

ئەم هەواڵە بەیەزید و هاوەڵانی گەیشت و ئەوانی ترساند. یەزید لای حەیانی نەبتی سکاڵای کرد و وتی: ئەوەی لەنێوان من و تۆدا بوە، رێگەی ئەوەت لێناگرێت کە چاکەخوازی موسوڵمانان و چارەسەرکەری کێشەکانی ئەوان بیت، تۆ لەکاروبارەکان جەرجان ئاگادار بویتەوە، رێگەیەك بۆ بەدەست هێنانی ئاشتی بدۆزەرەوە. حەیان ڕۆشتە لای ئیسپەهبۆد و وتی: من پیاوێك لەئێوەم هەرچەندە دینەکەم جیایی لەنێوانماندا دروست کردوە. چاکەخوازی ئێوەم و تۆم لەیەزید زیاتر خۆش دەوێت. ئەو کەسی بۆ دەرباری خەلیفە رەوانە کردوە و داوای هاوکاری کردوە و هێزە پشتیوانەکان بەرێکەوتون. سوپاکەی ئێوە زیانیان لەبەشێکی سوپاکەی داوە و من دڵنیا نیم ئەگەر ئەو

سوپایە هێرشتان بکەنەسەر بتوانن لەبەرابەر ئەوان خۆراگری بکەن، خۆت ئاسودە بکە و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستە. ئەگەر تۆ لەگەڵ ئەو ئاشتی بکەیت، شمشێری تیژی خۆی بەرەو لای خەڵکانی جەرجان دەسورێنێت چونکە پەیمانەکەیان شکاند و شەڕکەرانی موسوڵمانیان کوشتار کرد. لەسەر بنەمای پێدانی حەوتسەد هەزار یا پێنسەد هەزار دینار و چوارسەد باری زەعفەران (یا بەهاکەی بەزێر) و چوارسەد پیاو، بەهەر پیاوێك قەڵغانێك و جامێکی سیمین و جل و بەرگی هەوریشمین و شاڵ و قوماش پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و بۆ لای یەزید گەڕایەوە و وتی: کەس رەوانە بکە و تاوانی ئاشتیان لێ وەربگرە. یەزید کەسی رەوانە کرد و ئەوەی لەپەیمانی ئاشتیەکە حەیان نوسیبوی، وەریگرت. دواتر روی کردە جەرجان. یەزید دوسەد هەزار درەم تاوانی لەسەر حەیان دانابو. هۆکارەکەی ئەوەبو کە حەیان بۆ موخەلید کوڕی یەزید نامەی نوسی و لەخۆیەوە دەستی پێکرد. کوڕەکەی موقاتیل کوڕی حەیان پێی وت: نامە بۆ موخەلید دەنوسیت و لەخۆتەوە دەست پێدەکەیت؟ وتی: بەڵێ و ئەگەر پەسەندی نەکات، ئەو بەڵای بەسەردادێت کە بە سەر قوتەیبەدا هات. موخەلید نامەکەی بۆ باوکی رەوانە کرد و یەزید لەبەر ئەم کارە دوسەد هەزار درەم تاوانی لەسەر دانا.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری رۆشتنی یەزید بۆ جەرجان ئەوە بو کەصولی تورکی لەکەهستان و بوحەیرە ژیانی بەسەر دەبرد. ئەمە دورگەیەکە کە پێنج فەرسەخ لەکەهستانەوە دورە و هەردوك لە جەرجان لەنزیکی خوارزمە. ئەو هێرشی دەکردە سەر فیروز بن گول سنورداری جەرجان و سەرزەمینەکەی تالآن دەکرد. فیروز ترسا و رۆشتە لای یەزید لەخوراسان. یەزید لەهۆکاری هاتنەکەی پرسی: وتی: لەصول ترسام و هەلأتم. صول جەرجانی گرت. یەزید بەفیروزی وت: ئایا فێڵێك دەتوانی بکەیت تا بۆ شەڕ کردن هانی بدەیت؟ وتی: بەڵێ، تەنیا یەك رێگە هەیە کەئەگەر بەدەستی بێنێت، دەتوانی بیکوژی یا خۆی تەسلیم بەتۆ دەکات. وتی: چیە؟ وتی: بۆ ئیسپەهبۆد نامە بنوسە و داوای لێبکە فێڵ لەصول بکات تا لەجەرجان بمێنێتەوە و بۆ ئەم کارە پاداشتێك بۆ ئیسپەهبۆد دیاری بکە. ئەو بۆ نزیك بونەوە لەوصل نامەکەی تۆی بۆ دەنێرێت کە لە جەرجان کۆچ دەکات و لەبوحەیرە دادەبەزێت. ئەگەر لەگورگان کۆچ بکات، دەتوانیت گەمارۆی بخەیتە سەر و لەناوی ببەیت. یەزید ئەو کارەی کرد و پەنجا هەزار دیناری

وەك پاداشت بۆ ئیسپەهبۆد دیاری کرد تا رێگەی رۆشتن بۆ بوحەیرە لەصول بگرێت و لەجەرجان بیهێڵێتەوە. ئیسپەهبۆد نامەکەی بۆ صول رەوانە کرد و کاتێك نامەکەی پێگەیشت، بەرەو بوحەیرە بەرێکەوت و لەقەلاکاندا سەنگەری گرت. هەواڵی بەرێکەوتنی بەیەزید گەیشت. هاتەدەر و لەگەڵ فیروز بەرەو جەرجان بەرێکەوت. کورەکەی موخەلیدی کردە جێگری خۆی لەخوراسان و کورەکەی تری یانی معاویەی کردە فەرمانداری سەمەرقەند و کێش و نەسەف و بوخارا و حاتەم کوڕی قەبیصە کوڕی موهەلبی کردە فەرمانداری تەخارستان. بەرێکەوت و گەیشتە جەرجان و رۆشتە ناو شارەکە و کەس رێگەی لێ نەگرت. لەوێوە بەرەو بوحەیرە بەرێکەوت و لەوێ گەمارۆی خستە سەر صول. صول دەهاتەدەر و شەڕی لەگەڵ دەکرد و دەگەڕایەوە. شەش مانگ بەم شێوەیە بەردەوام بون و لەم کاتەدا مەرگ و نەخۆشی لەناو ئەواندا بلاو بویەوە. صول کەسی رەوانە کرد و داوای ئەمانی بۆ خۆی و کەسانی بنەماڵەکەی و سێسەد کەس لەکەسە نزیك و تایبەتیەکانی خۆی کرد تا بوحەیرەی تەسلیم بکات. یەزید رازی بو و سول لەگەڵ سێسەد کەس لەوانەی خۆشی دەویستن، رۆشتەدەر.

یەزید چواردەهەزار کەس لەتورکەکانی بەنەشکەنجە کوشت و کەسانیتری ئازاد کرد. شەڕکەران داوای رۆژی و تالانی خۆیانیان دەکرد و یەزید بەئیدریس کوڕی حەنزەلەی عەممی وت: ئەو سامانەی لەبوحەیرەیە بیخەملێنە تا لەناو سوپاکەدا دابەشی بکەین. ئیدریس نەیتوانی زۆری سامانە جۆراوجۆرەکانی بوحەیرە بخەملێنێت، بەیەزیدی وت: چونکە لەناو دەفرەکاندایە ناتوانم بیژمێرم، با گوێنیەکان ببزێن و ئەوەی لەناویاندایە بیخەملێنن و بەسەر سوپاییەکاندا دابەشی بکەن و بەم شێوەیە هەر کەسێك کەشتێك هەڵبگرێت، دەزانین چەندە گەنم و جۆ و برنج و کونجی و هەنگوینی هەڵگرتوە. ئەو کارەیان کرد و شتی زۆریان هەڵگرت. شەهر کوڕی حەوشەب سەرپەرەستی گەنجینەکانی یەزید کوڕی موهەلیب بو. سەبارەت بەو وتیان کە هەمانەیەکی دزیوە. یەزید لەوبارەوە پرسیاری کرد و شەهر گەڕاندیەوە و یەزید دوبارە بەشەهری بەخشی و یەکێك لەمبارەوە وتی:

لقد باع شهر دينة بخريطة فمن يامن القراء بعدك يا شهر

یانی: شەهر دینەکەی خۆی بەهەمانەیەك گۆڕییەوە، ئەی شەهر، دوای تۆ، چ

کەسێك ئەمینی قورئان خوێنەکان بێت؟

مورەی حەنەفی وتی:

یا ابن مهلب نا اردت الی امری          لولاك كان كصالح القراء

یانی: ئەی کوڕی موهەلیب، تۆ چ کارێکت بەم پیاوە بو، چونکە ئەگەر تۆ نەدەبویت، لەقورئانە خوێنە رێزدار و شیاوەکان دەبو.

یەزید لەجەرجان تاجێکی گەوهەرنیشانی دەست کەوت. وتی: کەس دەناسن، دڵ بەمە نەبەستێت؟ وتیان: نە. محەممەد کوڕی واسعی ئەزدی بانگ کرد و وتی: ئەم تاجە بگرە. وتی: پێویستم پێی نیە. وتی: سوێندت دەدەم. وەریگرت. یەزید فەرمانی بەپیاوێکدا بەنهێنی شوێنی بکەوێت تا بزانێت چی لەتاجەکە دەکات. بینی گەیشتە سواڵکەرێك کە داوای پشیزێکی لێکرد و محەممەد تاجەکەی پێ بەخشی. پیاوی سواڵکەری گرت و بردیە لای یەزید و لەو بەسەرهاتە ئاگاداری کردەوە. یەزید تاجەکەی وەرگرت و لەجیاتی ئەوە سامانێکی فراوانی بەسواڵکەرەکە بەخشی.

## دەست بەسەردا گرتنەوەی دوبارەی جەرجان

ئێمە ئاماژەمان بەگرتنی جەرجان و کەهستان و پەیمان شکێنی خەڵکەکەیدا. کاتێك یەزید لەگەڵ ئیسپەهبۆدی تەبەرستان ئاشتی کرد، بەرەو جەرجان بەرێکەوت و پەیمانی لەگەڵ خوا بەست ئەگەر بەسەر جەرجانیەکان سەرکەوتویی بکات شمشێر لەوان هەڵنگرێت تا بەخوێنی ئەوان گەنم بکاتە ئارد و نان بکات و بیخوات. ڕۆشتە ئەو شارە و لەقەڵای فەجا گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی. کەسێك کە دانیشتوی ئەم قەڵایەك بێت بۆ ماوەیەك پێویستی بەخواردن و خواردنەوە نابێت. یەزید بۆ ماوەی حەوت مانگ گەمارۆی لەسەر دانان. ئەوان دەهاتنەدەر و شەڕیان لەگەڵ دەکرد و دەگەڕانەوە.

لەهەمان کات کەبەم شێوەیە بەردەوام بون، پیاوێك لەعەجەمەکانی خوراسان بۆ راو هاتە دەر. دەستەیەك دەڵێن: پیاوێك لەخەڵکانی تەی بو. ئەو بزنە کێویەکی لەو کوێستانە بینی و نەهاتەخۆ تا گەیشتە لای سوپاکەی ئەوان. گەڕایەوە و وای نیشاندا کە بۆ لای سوپاکەی خۆی دەگەڕێتەوە. جلەکانی بەری لەت لەت کرد و وەك نیشانە بەدارەکانەوە هەڵیدەواسی و دواتر هاتە لای یەزید و ئاگاداری کردەوە. یەزید بەڵێنی پێدا خوێنبایی پیاوێکی پێببەخشێت ئەگەر ئەوان بۆ ئەو قەڵایە رێنوێنی بکات. ئەو

سێسەد پیاوی هەڵبژارد و خالید کوڕی یەزیدی کردە فەرماندەی ئەوان و پێی وت: تۆ کە ژیانت دەستەمۆ کرد، لەلایەن ئەو پیاوەوە سەرکوت نەکرێیت، ئاگاداربە کە تێکشکاو بۆ لای من نەگەڕێیتەوە. جەهم کوڕی زەحری پەیوەستی ئەو کرد و بەو پیاوەی وت: کەی دەگەنە ئەوێ؟ وتی: بەیانی. بەیانی لەکاتی نوێژی ئێوارێ. یەزید وتی: هەوڵ دەدەم لەکاتی نیمەڕۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان بکەم.

ئەوان بەڕێکەوتن و کاتێك بەیانی داهات و نیمەڕۆ گەیشت، یەزید هەمو خێوەتەکانی سوپاکەی سوتاند و بڵێسەکانی ئاگر بۆ ئاسمان بەرز بویەوە. دوژمنەکان سەیری ئاگرەکەیان کرد و ترسان و هاتنەدەر و یەزید روبەرویان بویەوە و شەڕیان دەست پێکرد. هاوەڵانی یەزید کەبۆ شەڕی تورکەکان بەڕێکەوتبون، پێش نوێژی ئێوارێ هێرشیان کردە سەر ئەوان. جەرجانیەکان لەو قۆڵەوە هەستیان بەناسودەیی دەکرد و یەزید لەم قۆڵەوە شەڕی لەگەڵ ئەوان دەکرد. نەهاتبونەخۆ کە بانگی تەکبیریان لەپشت سەری خۆیانەوە بەست. هەمویان بۆ ناو قەلاگانی خۆیان پاشەکشێیان کرد. موسوڵمانان کەوتنە گیانیان و کوشتاریان کردن و سەرئەنجام خۆیان تەسلیمی موسوڵمانان کرد و ملکەچی فەرمانەکانی یەزید بون. ئەو ژن و منداڵەکانی ئەسیر و شەڕکەرانی کوشتار دەکرد و بەدرێژایی دو فەرسەخ داری ئیعدامی هەڵواسی و راست و چەپی رێگەی لەکوژراوانی ئەوان پڕ دەکرد. دوانزە هەزار کەسی ئەوانی بردە دەشتی جەرجان و وتی: هەر کەس دەیەوێت تۆڵە بستێنێت، دڵی خۆی فێنك بکاتەوە. موسوڵمانەکان چوارچوار و پێنج پێنج دەیانکوشت. خوێنی ئەوانی کردە ئاشەکان تا گەنم بکاتە ئارد و نان بکات و بیخوات و سوێندەکەی خۆی بێنێتەدی. گەنمی کردە ئارد و نانی کرد و خواردی. دەڵێن: چل هەزار کەس لەوانی کوشت.

ئەو شاری جەرجانی دروست کرد کەپێشتر دروست نەکرابو. جەهم کوڕی زەحری جوعەفی کردە فەرمانڕەوایی جەرجان و بۆ خوراسان گەڕایەوە. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو یەزید لەکاتی بەڕێکەوتنی هاوەڵانی بەوانی وت: کاتێك گەیشتنە شار، چاوەڕێ بن و کاتێك بەرەبەیان داهات، تەکبیر بڵێن و هێرش بکەنە سەر دەروازەکان چونکە من لەوێ دەبینن کە خەڵکانم لەوێ کۆکردۆتەوە. کاتێك کوڕی زەحر رۆشتە ناو شارەکە، تا ئەو کاتەی یەزید دیاری کردبو، چاوەڕێی کرد، کاتێك بەرەبەیان

داهات، تەكبیری وت و خەڵكان ترس كەوتە دڵیان. سوپاكەی یەزید هەر كەسێكیان دەبینی، دەستبەجێ دەیانكوشت. توركەكان ترسان و سەرگەردان بون و نەیاندەزانی روو لەكوێ بكەن. یەزید دەنگی تەكبیری بیست و لەگەڵ خەڵكەكەی خۆی بەرەو دەروازەكە پێشڕەوی كرد بەلام كەسی نەبینی رێگەی لێ بگرێت یا بەرهەڵستی بكات چونكە سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ موسوڵمانەكان بون. لەهەمان سات رۆشتە ناو قەلاكە و خەڵكەكەی كردە دەر و لەچەپ و راست بەدرێژایی دوفەرسەخ داری ئیعدامی هەڵواسی. خەڵكەكەی ئەسیر و سامانەكانی تالان و نامەی بۆ سلێمان كوڕی عەبدولمەلیك نوسی و لەسەركەوتنەكەی خۆی ئاگاداری كردەوە و رایگەیاند كە لەقەلاكە شەشسەد هەزار دیناری وەك تالانی دەست كەوتوە. دەبیرەكەی موغەیرە كوڕی ئەبی قورە لەموالیەكانی بەنی سەدوس ئامۆژگاری كرد و پێی وت: ئەندازەی سامانەكە مەنوسە چونكە یەكێك لەم دو پێشهاتە رودەدات: یا بەزۆری دەزانێت و فەرمان دەدات هەمو سامانەكە رەوانە بكەیت یا بەتۆی دەبەخشێت. دواتر تۆ دیاریەكان جیا دەكەیتەوە و بۆ ئەوەی رەوانە دەكەیت بەلام هەرچەندە رەوانە بكەیت، ئەو بەكەمی دادەنێت. تۆ دەبینم كە هەمو سامانەكەی خۆت بەدیاری بۆ ئەو دەنێریت بەلام ئەو رازی ناكات. دواتر ئەم سامانانە لەناو دەفتەرەكانی ئەواندا دەمێنێتەوە وئەگەر كەسێك دوای تۆ بێتە سەر كار، داوایان دەكات وئەگەر جڵەوی كاروبارەكان بگرێتە دەست، بەچەندین بەرابەری ئەوە رازی نابێت. نامەی بۆ بنوسە و داوای لێبكە، بۆ ئەم دیارە كۆچ بكات. دواتر خۆت لەهەمو شتێك ئاگاداری بكەرەوە چونكە بەم شێوەیە زیانەكانی بۆ تۆ كەمترە. یەزید رازی نەبو، نامەكەی مۆر كرد و رەوانەی كرد. دەستەیەك دەڵێن: بڕی ئەو سامانە چوار هەزار هەزار دینار بو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا ئەیوب کوڕی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك (جێگری خەلیفە) کۆچی دوایی کرد. هەروەها لەم ساڵەدا شاری ئێسلاوان دەستی بەسەردا گیرا. لەمبارەوە ئاماژەمیان بەگێڕانەوەیەکی دیکە داوە کە پێشتر ئاماژەمان پێدا. هەروەها لەم ساڵەدا داوود کوڕی سلێمان لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و قەلای (زن)ی لەنزیك ماڵت (مەلتیە) گرت. لەم ساڵەدا چەندین ئەردهەژێنی گەروە لەجیهان رویدا و بۆ ماوەی شەش مانگ بەردەوام بو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عوبەیداللە کوڕی عەبداللە کوڕی عوتبە کوڕی مەسعود، ئەبو عوبەیدە کۆیلەی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف (ناسراوی بەناوی مەولای کوڕی ئەزهەر) عەبدولرەحمان کوڕی یەزید کوڕی حارسەی ئەنساری و سەعید کوڕی مەرجانە لەموالیەکانی قوڕەیش. مەرجانە مامی بو و ناوی باوکی عەبداللەیە.

لەم ساڵەدا عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید فەرمانداری مەککە ئاییئی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. کارگوزارەکان هەمان کەسانی پێشو بون جگە لەفەرمانداری بەسرە کە یەزید، سوفیان کوڕی عەبداللەی کەندی دەست نیشان کرد.

## ڕوداوەکانی ساڵی نەوەد و نۆی کۆچی ( ٧١٧ - ٧١٨ زایینی )

## مردنی سلێمان کوڕی عەبدولەلیك

لەم ساڵەدا دە ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی صەفەر/ یەکی ئۆکتۆبەری ٧١٧ زایینی سلێمان کوڕی عەبدولەلیك کۆچی دوایی کرد. ڕۆژگاری خەلافەتی ئەو دو ساڵ و پێنج مانگی خایاند. دەستەیەك دەڵێن: لەدە ڕۆژی یەکەمی مانگی صەفەر/ ٢٢ سێپتامبەری ٧١٧ زایینی مرد کەبەم شێوەیە ماوەی خەلافەتی دو ساڵ و هەشت مانگ پێنج ڕۆژ کەم درێژەی کێشا. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوێژی لەسەر خوێند. خەڵکان دەیانوت: سلێمان کلیلی چاکەکاریە، حەجاج لەفەرمانڕەوایی ئەوان دورکەوتەوە و سلێمان هاتەسەر کار و ئەسیرەکانی ئازاد و زیندانەکانی خاڵی کرد و هەڵس و کەوتی چاکەی لەگەڵ خەڵك گرتەبەر و عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی هێنایە سەرکار. لەدابق لەسەرزەمینی قینسرین مرد. ڕۆژێك جل و بەرگی سەوزی لەبەر کرد و دەستارێکی سەوزی لەسەر بەست، سەیری ئاوێنەی کرد و وتی: من هەمان پاشایی بەختەوەرم. هەینیەك تێنەپەڕی کەمرد. کەنیزەکەی سەیری کرد. وتی: بۆ سەیر دەکەیت؟ وتی:

انت نعم المتاع لو كنت تبقى غير ان لا بقاء للانسان

بيس فيما علمته فيك عيب كان فلا الناس غير انك فان

یانی: تۆ کاڵایەکی باشیت ئەگەر دەمایتەوە بەڵام هاوار (لەمرۆژە) چوونکە نامێنێتەوە. لەکەم و کوڕیەکانی خەڵکان هیچ بەهرەیەکت نیە جگە لەوەی کەتۆیش دەمریت.

دەڵێن: سلێمان لەگەڵ جەستەی پیاوێك لەدابق بەرێگادا دەڕۆشت و ئەویان لەگۆڕستانێك بەخاك سپارد. لەو خاکەی هەڵگرت و وتی: چەندە خاکێکی بۆنخۆشە! هەینیەك تێنەپەڕی کە لەتەنیشت ئارامگای ئەو پیاوە بەخاکیان سپارد.

دەڵێن: سلێمان حەجی کرد و شاعیرەکان حەجیان کرد. کاتێك گەیشتە مەدینە، هاورێ لەگەڵ چوارسەد ئەسیری ڕۆمی پێشوازیان لێکرد. سلێمان دانیشت و نزیکترین کەس لەو عەبداللە کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب بو. بەتریقەکەیان

هێنایە پێش. سلێمان وتی: ئەی عەبداللە، هەستە و بیکوژە. عەبداللە شمشێری لەپاسەوانێك وەرگرت و سەری جیا کردەوە. ئەوانیتریان بەکەسانی دیکە سپارد تا بیانکوژن. پێشنیاری ئەم کارەیان بە گەورەکان دەکرد. پیاوێك لەرۆمیەکانیان بەجەریر سپارد. بەنی عەبەس شمشێرێکی تیژیان پێدا کە لەپیاوەکەی دا و سەری خستە سەر زەوی. ئەسیرێکیان بەفەرەزدق دا و شمشێرێکی کولیان خستە بەردەست کە چەندین شمشێری لێدا بەڵام نەیتوانی هیچ کارێك بکات. سلێمان و خەڵکان پێکەنیتن و بەنی عەبەس (خاڵەکانی سلێمان) ئەویان سەرکۆنە کرد. ئەو شمشێرەکەی فرێدا و وتی:

و ان يك سيف خان او قدر اتى بتاخير نفس حتفها غير شاهد

فسيف بنى عبس و قد ضربوا به نبا بيدى ورقاء عن راس خالد

كذاك سيوف الهند تنبوا ظباتها و تقطع احيانا مناط القلائد

یانی: ئەگەر شمشێرەکە کول بو یا چارەنوس گرتنی گیانێکی دواخست کە هێشتا کۆتاییەکەی نەهاتوە، شمشێری بەنی عەبەس لەدەستی خالید لەبڕینی سەری وەرقا ء ناتەوان بو. بەم شێوەیە، شمشێرە تیژە هیندیەکان هەندێ کات کول دەبن و هەندێ کات ملوانکەیەکی زێرین گەردنی پەری پەیکەرەکان دەبڕێت.

وەرقا ء هەمان وەرقا ءکوڕی جەزیمەی عەبەسیە کە بە شمشێر لەخالید کوڕی جەعفەر کوڕی کەلابیدا. خالید هێرشی کردە سەر باوکی وەرقا ءو بەشمشێر لێیدا و کوشتی و دوای ئەوە وەرقا ءگەیشت و چەندین شمشێری لەخالید دا بەڵام نەیتوانی کارێك بکات. وەرقا عکوڕی زوهەیر وتی:

رايت زهيرا تحت كلكل خالد فاقبلت اسعى كالعجول ابادر

فشلت يمينى يوم اضرب خالدا و يمنعه منى الحديد المظاهر

یانی: زوهەیرم لەژێر جەستەی خالیدا بینی و بەپەلە بەرەو لای رۆشتم. گۆج بێت دەستی راستم ئەو رۆژەی کە لەخالیدمدا وئەو ئاسنەی لەبەری کردبو، لەبەرابەر شمشێرەکەی من پارێزگاری لێکرد.

## خەلافەتی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز

### لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بویە خەلیفە.

هۆکارەکەی ئەوە بو کە سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك( بەهەمان شێوە کەئاماژەمان پێدا) لەدابق نەخۆش کەوت. کاتێك نەخۆشیەکەی دژوار بو، وەسیەتی کرد و خەلافەتی بەیەکێك لەکوڕەکانی سپارد کە هێشتا منالّ بو. ڕەجا ءکوڕی حەیوە پێی وت: ئەی سەرورەری باوەڕداران، چی دەکەیت؟ لەو شتانەی خەلیفە لەگۆڕەکەیدا ئاسودە دەکات ئەوەیە کە جێگرێکی شیاو بۆ خۆی دیاری بکات. سلێمان وتی: داوای چاکە لەخوا دەکەم و دەپارێمەوە تا ڕێنوێنیم بکات، بیر لەم کارە دەکەمەوە بەلاّم هێشتا بڕیاری کۆتاییم نەداوە. سلێمان چەند ڕۆژێکی دیکە چاوەڕێی کرد و دواتر وەسیەتەکەی دڕاند و ڕەجا ی بانگ کرد و وتی: ئەندێشەت سەبارەت بەداوودی کوڕەم چۆنە؟ وتی: ئەو لەبەرچاوی تۆ نیە و لەکۆسنتانتین ئۆپێلە و تۆ نازانی کە زیندوە یا مردوە. سلێمان وتی: کێ بە شیاو دەزانیت بۆ خەلافەت؟ ڕەجا ءوتی: هەر کەس تۆ پەسەندی بکەیت. سلێمان وتی: سەبارەت بە عومەر کوڕی عەبدولعەزیز چی دەڵێیت؟ ڕەجا ءدەڵێت: وتم: سوێند بەخوا پیاوێکی چاکەکار و ڕێزدارە. سلێمان وتی: بەو شێوەیە کە تۆ دەڵێیت، ئەگەر ئەو دیاری بکەم و دوای ئەو کەس دەستنیشان نەکەم ئاژاوە دروست دەبێت و ڕێگە نادەن فەرمانڕەوایی بکات مەگەر ئەوەی خۆی کەسێك دیاری بکات. عەبدولمەلیك پێشنیاری بەوەلید و سلێمان کردبو دوای خۆیان یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بکەنە خەلیفە. سلێمان فەرمانیدا کە دوای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بکەنە خەلیفە. یەزید ئامادە نەبو و لەمەککە ئایینی حەجی (عەمرەی) ئەنجامدەدا. ڕەجا ء دەڵێت: وتم: فەرمان فەرمانی تۆیە. سلێمان قەڵەمی هەڵگرت و نوسی:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی بەخشەر، ئەمە فەرمانێکە لەبەندەی خوا، سەرورەری باوەڕداران سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز. من تۆم کردە جێگری خۆم لەدوای خۆم و لەدوای تۆ یەزید کوڕی عەبدولمەلیك. فەرمانەکانی ببیستن و فەرمانبەر بن و لەخوا بترسن و ناسازگاری مەکەنە پیشە چونکە دوژمنان چاوی تەماحیان لەئێوە بڕیوە. نامەکەی مۆر کرد و کەسی بەدوای کەعب کوڕی جابری

عەبەسی سەرکردەی پاسەوانەکانی ڕەوانە کرد و وتی: کەسانی بنەماڵە و نزیکەکانم لەدەوری من کۆبکەرەوە. کەعب ئەوانی کۆکردەوە. دوای هاتنی ئەوان سلێمان بەرەجا ی وت: وەسیەتەکەی منیان بۆ بخوێنەرەوە و فەرمانیان پێبدە دوای من لەگەڵ جێگرەکەم بەیعەت بکەن.

ڕەجا ئەو کارەی کرد. وتیان: بڕۆین و سڵاو لەسەرومری باوەڕداران دەکەین؟ وتی: بەڵێ. ڕۆشتنە لای سلێمان. سلێمان بەوانی وت: ئەم وەسیەتە فەرمانی منە. ببیستن و فەرمانبەر بن وئەو کەسەی دیاریم کردوە بەسەرومری خۆتانی بزانن. ئەوان یەك یەك بەیعەتیان کرد و بڵاوەیان لێکرد.

ڕەجا ئەڵێت: دوای ئەوە عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتە لای من و وتی: دەترسم ئەم کارەیان بەمن سپاردبێت، سوێندت دەدەم بەخواوەندی خوا، ئەگەر ئەو کارەیان بەمن سپاردوە، ئاگادارم بکەرەوە تا داوای بەخشین بکەم و پێش ئەوەی نەتوانم هیچ کارێك بکەم، خۆم لەم کارە دوربخەمەوە. ڕەجا ءوتی: لەئێستادا یەك وشە لە من نابیستیت. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز توڕە لای من ڕۆشت.

ڕەجا ئەڵێت: دوای ئەوەی چاوم بەهوشام کوڕی عەبدولمەلیك کەوت و وتی: من لای تۆ پارێزراوم و هاورێیەتیەکەی کۆن لەنێوان ئێمەدا هەیە، لەم کارە ئاگادارم بکەرەوە تا ئەگەر کەسێك جگە لەمن بۆ ئەم کارە دەست نیشان کراوە، بارودۆخ بگۆڕم. سوێند بەخوا ئەم نهێنیە بەهیچ کەسێك ناڵێم. ڕەجا ءدەڵێت: ئامادە نەبوم یەك وشە بێنمە سەر زمان. هوشام گەڕایەوە و بەردەوام داخی دەخوارد و دەیوت: ئەی هاوار، ئەگەر من نیم، کەواتە کێ بۆتە خەلیفە؟ ئایا ئەگەری هەیە خەلافەت لەناو منداڵەکانی عەبدولمەلیکدا نەمابێت؟

ڕەجا ءدەڵێت: ڕۆشتمە لای سلێمان و بینیم لەمەرگ نزیك بۆتەوە. هەرجار کە بێهۆش دەبو، بەرەو ڕوی قیبلە دەمسوڕاند و کاتێك دەهاتە هۆش، دەیوت: هێشتا کاتی نەهاتوە. دو سێ جار ئەم کارەم کرد. بۆ سێیەمین جار، وتی: ئەگەر شتێکت دەوێت، هەر ئێستا دەست پێبکە، شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخواوەند نیە و محەممەد نێردراوی ئەوە. بەرەو رووی قیبلە سوڕاندم کەچاوی لەجیهان بەست. کاتێك چاوەکانیم خستە سەریەك و دامپۆشی و دەرگاکەم داخست، کەسم بەدوای ژنەکەیدا ڕەوانە کرد. وتی:

چۆن ژیان بەسەر دەبات؟ وتم: خەوتوە و داپۆشراو. نێردراو سەیری کرد کەداپۆشرابو، گەڕایەوە و ژنەکەی ئاگادار کردەوە. دەڵێت: کەسێکم لەبەردەرگا دانا کە باوەڕم پێی بو و فەرمانم پێدا لەوێ دور نەکەوێتەوە و رێگە نەدات کەس بڕواتە لای خەلیفە. دەڵێت: هاتمەدەر و کەسم بەدوای کەعب کوڕی جابر رەوانە کرد تا بنەماڵە و کەسەکانی سلێمان کۆبکاتەوە. هەمویان لەمزگەوتی دابق کۆبونەوە. وتم: بەیعەت بکەن. وتیان: جارێك کردمان. وتم: جارێکی دیکە بەیعەت بکەن، ئەمە فەرمانی سەروەری باوەڕدارانە. ئەوان دوبارە بەیعەتیان کرد. کاتێك دوای مەرگیش بەیعەتیان کردو دڵنیابوم کاروبارەکانم جێگیر کردوە، وتم: بڕۆنە لای سەروەری باوەڕداران چونکە مردوە. وتیان: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦) وەسیەتەکەم خوێندەوە و کاتێك گەیشتمە ناوی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، هوشام وتی: سوێند بەخوا هەرگیز لەگەڵ ئەو بەیعەت ناکەین. وتم: سوێند بەخوا دەتکوژم، هەستە و بەیعەت بکە. هەستا و بەناچاری هاتە پێش. رەجا ءوتی: بازوی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزم گرت و ئەوم لەسەر تەختی وتاردان دانیشاند و لەتاو ئەو بارە قورسەی کەوتبوە سەرشانی بەردەوام سرودی مەرگی دەخوێند و هوشام لەتاو ئەوەی فەرمانڕەوایی بەدەست نەهێنا بو، پرسەی دەگێڕا.

سلێمانیان شۆرد و کفنیان کرد و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوێژی لەسەر خوێند و دواتر دفنیان کرد. کاتێك رێ و رەسمی بەخاك سپاردن تەواو بو، چوارپێ سواریەکانی پاشایان هێنا کە هەوساری هەرکام لەدەست جڵەودارێکدا بو. وتی: ئەمە چیە؟ وتیان: چوارپێکانی تایبەت بەخەلافەت. وتی: چوارپێکەی خۆم باشترە. سوار چوارپێکەی خۆی بو و ئەوانی دیکەی گەڕاندەوە. بەرێکەوت. وتیان: بۆ دەرباری خەلافەت؟ وتی: ژنان و منداڵەکانی ئەبو ئەیوب (سلێمان) لەوێ ژیان بەسەر دەبەن. خێوەتەکەی خۆم بەسە تا ئەو کاتەی لەوێ دەڕۆن. لەماڵەکەی خۆی مایەوە تا ئەو شوێنەیان چۆڵ کرد.

رەجا ءدەڵێت: ئەوەی لەگەڵ چوارپێکانی ماڵی سلێمان کردی، لای من پەسەند بو. دواتر دەبیرێکی بانگ کرد و نامەیەکی بۆ خوێندەوە و فەرمانی پێدا چەندین دانەی لێ بنوسنەوە و بۆ شارەکانی رەوانە بکەن.

کاتێك هەواڵی مەرگی سلێمان بە عەبدولعەزیز کوڕی وەلید گەیشت ( و هێشتا

ئاگادار نەبو بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بەیعەت وەردەگرن) ئالآی هەڵگرد و داوای لەخەڵکان کرد فەرمانبرداری لێ بکەن. ئاگاداریان کردەوە کە لەسەر پێشنیاری سلێمان بەیعەتیان لەگەڵ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کردوە. بەرێکەوت و هاتە لای عومەر. عومەر پێی وت: بیستومە لەگەڵ کەسانی دەوروبەری خۆت بەیعەتت بەستوە و مەبەستی ئەوەت کردوە بەسوپاکەت بێیتە ناو دیمەشق! وتی: ئەو کارەم کردوە بەلآم بەو شێوە بو کاتێك بیستم سلێمان مردوە وکەسی دیاری نەکردوە، ترسام کە سامانەکان تالآن بکەن. عومەر وتی: ئەگەر بەیعەت بکەیت و کاروباری تایبەت بەفەرمانڕەوایی بگریتە دەست، دژایەتی تۆ ناکەم و لەماڵەکەی خۆم دادەنیشم. عەبدولعەزیز وتی: دەمەوێت کە تۆ خەلیفە بیت. بەیعەتی کرد. خەڵك چاوەڕوان بون سلێمان کوڕەکانی خۆی پشت گوێ بخات و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بێنێتە سەرکار.

کاتێك خەڵکان لەگەڵ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بەیعەتیان کرد، بەژنەکەی فاتیمە کچی عەبدولمەلیکی وت: ئەگەر هاوڕێیەتی منت دەوێت، هەرچی خشڵ و زێر و گەوهەرە، بۆ گەنجینەی موسوڵمانان بگەڕێنەرەوە کە تایبەت بەوان چونکە من بەبونی ئەوان لەگەڵ تۆدا لەیەك ماڵدا نامێنمەوە. ژن هەمو خشڵەکانی گەڕاندەوە.

کاتێك عومەر مرد و برای ئەو ژنە (یەزید) هاتە سەرکار، خشڵەکانی بۆ گەڕاندەوە و وتی: دەزانم کە عومەر ستەمی لەتۆ کردوە. ژن وتی: سوێند بەخوا هەرگیز. وەری نەگرت و وتی: کەسێك نیم لەکاتی ژیان گوێڕایەڵی قسەکانی بکەم و دوای مەرگی نا. یەزید خشڵەکانی هەڵگرت و بەهاوسەر و منالەکانی خۆی بەخشی.

## جوێندان و سەرکۆنە کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالب

ئومەوییەکان سوکایەتیان بەعەلی کوڕی ئەبی تالب دەکرد تا کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت. سەرکۆنەی ئەم کارەی کرد و فەرمانی بۆ کارگوزارانی شارەکان نوسی تا ئەم کارە ناڕەوا بکەن.

هۆکاری خۆشویستنی عەلی کوڕی ئەبی تالب ئەوە بو کە دەیوت: لەمەدینە زانستەکان فێردەبوم لای عوبەیدالله کوڕی عەبدالله و عوتبە کوڕی مەسعود. هەواڵێکیان بیست کە من سەرکۆنەی عەلی کوڕی ئەبی تالبم کردوە. ڕۆژێك ڕۆشتمە لای و بینیم کە نوێژ دەخوێنێت. نوێژەکەی درێژ کردەوە و من چاوەڕێم دەکرد. کاتێك تەواو بو رووی کردە من و وتی: کێ بەتۆی وتوە خواوەند دوای رازی بون لەشەڕکەرانی بەدر و ئەوکەسانەی بەیعەتی رضوانیان بەست، لەوان توڕە بوە؟ وتم: نەمبیستوە. وتی: باسی ئەوەیان بۆ من کرد کە سەرکۆنەی عەلی کوڕی ئەبی تالب دەکەیت. وتم: داوای بەخشین لەخواوەند و لەتۆ دەکەم! ئەو کارە فێزەونەم لەبیر کرد. باوکیشم کاتێك قسەی دەکرد و دەکەوتە بیری عەلی کوڕی ئەبی تالب و بەشێوەیەکی خراپ باسی دەکرد، گیرۆدەی زمان گیران بو. وتم: باوکە تۆ بەباشی قسە دەکەیت بەلاَم کاتێك دەگەیتە عەلی کوڕی ئەبی تالب و دەتەوێت خراپەی ئەو بڵێیت، زمانت دەگیرێت. وتی: تۆ هەستت بەوە کرد؟ وتم: بەڵێ. وتی: کوڕم کەسانی دەوروبەری ئێمە ئەگەر وەك ئێمە ئاگاداری کارو کردەوەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالب بن، لەدەوری ئێمە بلاَو دەبنەوە و لەدەوری کوڕەکانی ئەو کۆدەبنەوە.

کاتێك عومەر هاتە سەرکار، ئارەزومەندی مەبەستەکانی ئەم دنیایە نەبو تا باری ئەم گوناحە بخاتە سەرشان. ئەو کارانەی پشت گوێ خست و نامەی بۆ هەمو شارەکان نوسی و فەرمانیدا ئەو کارە ناڕەوا بکەن و لەجیاتی ئەوە ئەم ئایە بخوێنن: خواوەند فەرمان بەچاکەکاری و دادپەوەری دەدات و لەخراپە و ستەم دورمان دەخاتەوە و ئامۆژگاریتان دەکات ئەگەری هەیە ئەوتان بیربکەوێتەوە (نحل/١٦/٩٠) ئەم کارەی لای خەڵکان بەچاکە ناوی برا و بۆ ئەم کارەی وەسفیان کرد. لەناو ئەوان کەسیر عێزەت وتی:

| | |
|---|---|
| ولیت و لم تشتم علیا و لم تخف | بریا و لم تتبع مقالة مجرم |
| تکلمت بالحق المبین و انما | تبین آیات الهدی بالتکلم |

و صدقت معروف الذی قلت بالذی فعلت فاضحی راضیا کل مسلم

آلا انما یکفی بعد زیغه من الاود البادی ثقاف المقوم

یانی: بوی بەپاشا و زمانت بۆ خراپ وتنی عەلی نەکردوە و بێ گوناحیت نەترساند و وتاری ستەمکارانت نەبیست. بەئاشکرا بەدوای راستی و دروستیدا گەڕایت، چونکە نیشانەکانی رزگاربون بەقسەکردن رون دەبێتەوە. بەو کارەی ئەنجامت دا، چاکەی ئەوەی باست کرد، پشت راستت کردەوە و هەمو موسوڵمانانت رەزامەند کرد. بۆ جوامێر، دوای گەڕانەوە لەستەمکاری ئەوەندە بەسە کە چەماوەیەك راست بکاتەوە و خراپەیەکی ئاشکرا لەناو ببات.

کاتێك عومەر ئەم هۆنراوەی بیست، وتی: بەم شێوەیە ئێمە رزگار بوین.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بۆ مەسلەمە لەسەرزەمینی رۆم نامەی نوسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ هاورێکانی خۆی لەموسوڵمانان بگەڕێتەوە. ئەسپی رەسەن و خۆراکێکی زۆری رەوانە کرد و فەرمانی بەخەڵکدا هاوکاریان بکەن. هەروەها لەم ساڵەدا تورکەکان هێرشیان کردە سەر ئازەربایەجان و دەستەیەك لەموسوڵمانانیان کوشت. عومەر، حاتەم کوڕی نوعمانی باهلی رەوانە کرد کە تورکەکانی کوشتار کرد بەشێوەیەك تەنیا ژمارەیەکی کەم لەوان رزگاری بو.. پەنجا کەسیان وەك ئەسیر بردە لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز.

هەروەها لەم ساڵەدا یەزید کوڕی موهەلیبی لەفەرمانداری عێراق لابرد و عودەی کوڕی ئەرتاتی فەزاری بۆ بەسەرە رەوانە کرد و عەبدولحەمید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی زەید کوڕی خەتابی عەدەوی قوڕەشی کردە فەرمانداری کوفە و ئەبو زەنادی پەیوەستی ئەو کرد و موسا کوڕی وەجیهی حێمیری بەدوای یەزید کوڕی موهەلیب رەوانە کرد.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حازم کارگوزاری عومەر لەمەدینە ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. فەرمانداری مەککە عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید بو، فەرمانداری کوفە عەبدولحەمید، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە عامری شەعبی، لەبەسرە عودەی کوڕی ئەرتات فەرماندار و

سەرپەرەستی دامەزراوەی داد حەسەن کوڕی ئەبی ئەلحەسەنی بەسری بو. دواتر عودەی داوای دەستە لەکارکێشانەوەی کرد کە عومەر رازی بو و ئەیاس کوڕی معاویەی کردە سەرپەرەستی دامەزراوەی داد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو حەسەن گلەیی کرد کەعودەی لەسەر کارەکەی لابرد و ئەیاسی کردە سەرپەرەستی دامەزراوەی داد. فەرمانڕەوایی خوراسان جەراح کوڕی عەبداللە حەکەمی بو.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: نافع کوڕی جوبەیر کوڕی موتعیم لەمەدینە، مەحمود کوڕی رەبیع کە لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بو، ئەبو زەبییان کوڕی حوصەین کوڕی جوندەبی جونوبی باوکی قابوس، ئەبو هاشم عەبداللە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب لەزیانی ئەو ژەهرەی دوای گەڕانەوە لەشام دەرخواردیاندا، سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کەسێکی دیاری کرد تا ژەهر خواردی کرد. کاتێك ئەوی بینی، بۆ لای محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عەباس لە حومەیمە گەڕایەوە و لەکارەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە و پێی وت کە خەلافەت بەکوڕەکانی ئەو دەگات و دبێت چی بکات. دواتر لای ئەو مرد. عوبەیداللە کوڕی شورەیح گۆرانیبێژی بەناوبانگ و ئەبو خەتاب عەبدولرەحمان کوڕی کەعب کوڕی مالك.

## رووداوەکانی ساڵی سەدی کۆچی ( ٧١٨- ٧١٩ )

## دەسپێکردنی شۆڕشی شوزەبی خارجی

لەم ساڵەدا شوزەبی خارجی شۆڕشی دەستپێکرد و خەڵکی بۆ شەر لەگەڵ فەرمانڕەواکانی ئومەوی هاندا. ناوی بەستام و نەژادی لەبەنی یەشکر لەجوخی دەژیا. هەشتا پیاو هاورێیەتیان دەکرد. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بۆ کارگوزاری خۆی لەکوفە نامەی نوسی و فەرمانی پێدا دژی ئەوان شەڕ نەکات تا ئەو کاتەی خوێن ڕشتن و ستەمکاری دەکەنە پیشە و ئەگەر ئەو کارەیان کرد پیاوێکی دورئەندێش و بەهێز بۆ روبەرو بونەوەی ئەوان رەوانە بکات.

عەبدولحەمید، محەممەد کوڕی جەریر کوڕی عەبداللەی بەجلی هاورێ لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر رەوانە کرد و فەرمانی رێز گرتن لەپێشنیارەکانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی پێدا. عومەر نامەی بۆ بەستام نوسی ولە هۆکاری شۆڕشەکەی پرسی. کاتێك نامەی عومەری بەدەست گەیشت کەمحەممەد کوڕی جەریر روبەروی ببویەوە بەلاّم لەشوێنەکەی خۆی نەدەجولاّ و هیچ کارێکی نەدەکرد.

لەنامەکەی عومەردا هاتبو: بیستوومە بۆ رێزگرتن لەتوڕەیی خواوەند و پێغەمبەرەکەی شۆڕشت دەست پێکردوە. لەمن بۆ ئەو کارە شیاوتر نیت. بۆ لای من وەرە تا لەمبارەوە پێکەوە گفتوگۆ بکەین. ئەگەر راستی و دروستی لای ئێمە بێت، باوەڕ بەو باوەڕە دێنێت کە خەڵکان باوەڕیان پێکردوە بەلاّم ئەگەر راستیەکان لای تۆ بێت، لێکۆڵینەوە دەکەین بۆ ئەوەی بزانین دەبێت چ کارێك ئەنجام بدەین.

بەستام نامەی بۆ عومەر نوسی: دادپەروەریت کرد، دو پیاو رەوانە دەکەم تا لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانی تۆ بکەن و لەگەڵ تۆدا بپەیڤن. پیاوێك بەناوی عاصم (موالی حەبەشی بۆ بەنی شەیبان) و پیاوێکی دیکەی لەبەنی شەیبان بۆ لای عومەر رەوانە کرد. ئەوان لەحوناصرە رۆشتنە لای عومەر. بەم دوانەی وت: چ هۆکارێك بۆ ئەم شۆڕشە پاڵی پێوەناون و لە چ کارێك توڕەن؟ عاصم وتی: لەهەڵس و کەوتی تۆ توڕە نین، تۆ لەسەر بنەمای دادپەروەری کاروبارەکان هەڵدەسوڕێنیت. ئێمە ئاگادار بکەرەوە ئایا ئەم خەلافەتی ئێوە بەراوێژ کردن و رەزامەندی خەڵك بوە یا بەزۆر ئەو کارەتان گرتۆتە

دەست.

عومەر وتی: نە داوای فەرمانڕەوایی لێ کردن، نەکاری ئەوانم بەزۆر گرتە دەست. پیاوێك پێش من بۆ ئەم کارە رایسپاردم و من ئەو کارەم لەئەستۆ گرت و کەس جگە لەئێوە رەخنەی نەگرت و خەلافەتی منی بەناخۆش نەزانی. ئێوە لەسەر ئەو باوەڕەن هەرکەسێك دادپەروەری بکاتە پیشە و لەسەر بنەمای راستی و دروستی فەرمانڕەوایی خەڵك بکات، دەبێت بە فەرمانڕەوایی ئەو رازی بن. من بەو پیاوە بزانن. ئەگەر پشتم کردە راستی و دروستی، هیچ فەرمانێك لەمن لەئەستۆی ئێوەدا نەبێت.

وتیان: لەنێوان ئێمە و تۆ تەنیا یەك شتە. وتی: چیە؟. وتی: بینیمان رەخنەت لەکاروباری بنەماڵەکەی خۆت گرت و بەستەمکار لەقەڵەمت دان. ئەگەر تۆ لەسەر رێگەی راست و ئەوان لەسەر رێگەی گومڕایین، نفرینیان بکە و بێزاری خۆت لەوان دەربڕە. عومەر وتی: تێگەیشتم کە ئێوە بۆ بەدەست هێنانی مەبەستەکانی ئەم دنیایە شۆڕشتان دەست پێنەکردوە بەڵکو بۆ بەدەست هێنانی ئەو دنیا، بەلام رێگەتان ون کردوە. خوای گەورە و رێزدار پێغەمبەرەکەی وەك کەسێکی نفرینکەر رەوانە نەکرد. ئیبراهیمی پێغەمبەر وتی: هەرکەس شوێنکەوتەیی من بێت، لەمنە و هەر کەس نافەرمانی بکاتە پیشە، تۆ گەورەیەکی میهرەبانی (ئیبراهیم/١٤/٣٦) دوبارە خوای گەورە فەرمویەتی: ئەوانە ئەو کەسانەن خوای گەورە رێنوێنی کردن، لەوان داوای رێنوێنی بکە (ئەنعام/٦/٩٠) من کارەکانی ئەوانم بەستەمکاری لەقەڵەمدا، تەنیا ئەم سەرکۆنە کردنە بەسە. نفرین کردنی خەڵکی سەرزەوی کارێکی شیاو نیە کە هیچ رێگە چارەیەکی نەبێت. ئەگەر دەڵێن: پێویست و شیاوە، پێم بڵێن، چ کاتێك نفرینی فیرعەونتان کردوە؟ وتی: بیرم نایەت نفرینی ئەوم کردبێت. عومەر وتی: کێشە نیە کە تۆ نفرینی فیرعەون نەکەیت کەخراپترینی خەڵکانی سەرزەوی بو، بەلام من دەبێت بنەماڵە و کەسەکانم نفرین بکەم لەکاتێکدا هەمویان نوێژیان دەخوێند وبەرۆژو دەبون. وتیان: بەم هەمو ستەمەوە ناباوەڕ نین؟ عومەر وتی: نا، چونکە پێغەمبەری خوا بانگەشەی باوەڕهێنانی کرد و هەرکەس باوەڕی پێ هێنا، پێشوازی لێکرد، و هەر کەسێك کەگوناحی کرد، قامچی لێدا و سزایدا.

پیاوی خارجی وتی: پێغەمبەری(د.خ)خوا خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان بەتاقانەیی

خواوەند و باوەڕ کردن بەنوسراوەی خواوەند بانگ دەکرد. عومەر وتی: هیچ کام لەوان نەیدەوت لەسەر بنەمای شێوازی پێغەمبەر(د.خ) کردوەکانم ئەنجام دەدەم بەلاّم ئەوان ستەمیان لەخۆیان کرد و دەیانزانی ئەم کارە ناڕەوایە. لەبەر ئەمە بو ئەزانەکان بەسەر ئەواندا زاڵبون. عاصم وتی: لەوەی لەگەڵ کارەکانی تۆ ناسازگارە، بێزاری خۆت دەربڕە و فەرمانەکانی ئەوان بەقێزەون لەقەڵەم بدە. عومەر وتی: سەبارەت بەئەبوبەکر و عومەر قسە بکەن ئایا لەسەر راستی و دروستی نەبون؟ وتیان: لەسەر راستی و دروستی بون. عومەر وتی: ئایا دەزانن کاتێك ئەبوبەکر شەڕی هەڵگەڕاوەکانی کرد، خوێنی ڕشت و ئەسیری کرد و سامانەکانی بەتالاّنی برد؟ وتیان: بەڵێ. عومەر وتی: ئایا دەزانن عومەر دوای ئەو بەهای ئازادی وەرگرت و ئەسیرەکانی بۆ بنەماڵەکانیان گەڕاندەوە؟ وتیان: بەڵێ. عومەر وتی: ئایا عومەر کوڕی خەتاب بێزاری لەئەبوبەکر دەربڕی؟ وتیان: نە. عومەر وتی: سەبارەت بەنەهرەوانیەکان بەمن بڵێن کە پێشڕەوانی ئێوە بون، ئایا دەزانن خەڵکی کوفە هاتنەدەر بەلاّم خوێنی کەسیان نەڕشت و سامانی کەسیان تالاّن نەکرد و دەرکراوکانی ئەوان لەخەڵکانی بەسرە، عەبداللە کوڕی خەباب و کەنیزێکی دوگیانیان سەربڕی؟ وتیان: بەڵێ. عومەر وتی: ئایا ئەوەی خەڵکانی نەکوشت، لەوەی خوێنی ڕشت و دەستی بەگوناحەکان پیس کرد، بێزاری خۆی دەربڕی. وتیان: نە. عومەر وتی: ئایا هیچ کام لەئێوە بێزاری خۆتان لەم دەستەیە دەردەبڕن؟ وتیان: نە. عومەر وتی: کێشە نیە کە ئێوە عومەر و ئەبوبەکر و خەڵکانی کوفە و بەسرەتان خۆش بوێت لەکاتێکدا دەزانن کردوەکانیان جۆراوجۆرە، بەلاّم من دەبێت بێزاری لەبنەماڵەکەم دەربڕم لەکاتێکدا دینەکەمان یەکێکە. لەخوا بترسن چونکە ئێوە زاناکانن، بەشتێك رازی دەبن کە پێغەمبەر(د.خ) سەرکۆنەی کردوە و سەرکۆنەی شتێك دەکەن کە پێغەمبەر(د.خ) پێی رازی بوە. لای ئێوە کەسێك بەئاسودەیی ژیان بەسەر دەبات کە لەو ترساوە و کەسێك لەئێوە دەترسێت کە ئەو ئەمانی پێ بەخشیوە. کەسانێك لەئێوە دەترسن کە شایەتی دەدەن خوایەك جگە لەخوا نیە و محەممەد بەندە و نێردراوی خوایە و ئەو کەسانەی لای پێغەمبەری خوا ئەمانیان پێ بەخشراوە و خوێن و سامانەکەیان پارێزراوە، بەدەستی ئێوە دەکوژرێن بەلاّم شوێنکەوتەکانی ئایینەکانی دیکە لای ئێوە ئەمانیان هەیە و پارێزگاری لەخوێن و سامانی ئەوان دەکەن.

یەشکری وتی: ئایا پیاوێکت بینیوە ببێتە فەرمانڕەوایی سامان و خوێنی خەڵکان و لەناو ئەوان بەدادپەروەری هەڵس و کەوت بکات و دواتر کارەکان دوای خۆی بەکەسێکی بێ ئەزموون بسپێرێت، ئایا ئەو راستی و دروستی کە خواوەند فەرمانی پێداوە، بەئەنجامی گەیاندوە و ئاسودە بوە؟ عومەر وتی: نە. وتی: ئایا ئەم کارە دوای خۆت بەیەزید دەسپێریت لەگەڵ ئەوەی دەزانیت ئەو لەسەر بنەمایی دادپەروەری هەڵس و کەوت ناکات؟ عومەر وتی: نە، کەسێك پێش من ئەوی بۆ ئەم کارە راسپارد و موسڵمانان لەمن زیاتر شارەزایی کاروبارەکانی خۆیانن. وتی: ئایا گومان دەکەیت کەسێك کە ئەو کارەی ئەنجام داوە، رێگەی راست و دروستی بڕیوە؟ عومەر گریا و وتی: سێ رۆژ مۆڵەتم پێ بدەن.

ئەو دوانە هاتنەدەر و دوای سێ رۆژ گەڕانەوە و عاصم وتی: شایەتی دەدەین کە تۆ لەسەر راستی و دروستیت. عومەر بەپیاوی یەشکری وت: تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: ئەوەی هێناتە سەرزمان، کەم و کوڕی تیا نەبو بەڵام هیچ فەرمانێك بۆ کاری موسوڵمانان نادەم و تەنیا وتەکانی تۆ بەوان دەگەیێنم تا بزانم بەڵگە و پاساویان چیە.

عاصم لای عومەر مایەوە کە فەرمانیدا بەخششی پێ بدەن و عاصم دوای پانزە رۆژ مرد. عومەر بەردەوام دەیوت: کاری یەزید منی لەناو برد و من نەمتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە. داوای بەخشین لەخواوەند دەکەم.

ئومەوییەکان ترسان کە سامانەکانیان لەدەست بڕوات و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز یەزید وەك جێگری خۆی لەسەر کار لاببات. لەبەر ئەمە کەسێکیان راسپارد کە عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی ژەهرخوارد کرد. سێ رۆژی نەخایاند کەنەخۆش کەوت و مرد. محەممەد کوڕی جەریر لەبەرابەر خەواریج ئوردوی لێدابو. هیچ کام شەڕیان لەگەڵ یەك نەدەکرد. چاوەڕوان بون تا نێردراوەکان لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بگەڕێنەوە. عومەر مرد و کاروبارەکان بەو شێوە بو.

## گەمارۆ خستنە سەر یەزید کوڕی موهەلیب

دانانی جەراح کوڕی عەبدالله لەخوراسان

دەڵێن: لەم ساڵەدا عومەر عەبدولعەزیز بۆ عودەی کوڕی ئەرتات نامەی نوسی و فەرمانی پێدا یەزید کوڕی موهەلیب زیندانی و بۆ لای ئەو رەوانەی بکات. عومەر بۆی نوسیبو جێگرێك بۆ خۆی دەستنیشان بکات و بڕواتە لای. ئەو کوڕەکەی موخەلیدی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و لەخوراسان ڕۆشتەدەر و لەواست دابەزی. دواتر سوار کەشتی بو و مەبەستی بەسرەی کرد. عودەی کوڕی ئەرتات، موسا کوڕی وەجیهی حێمیری رەوانە کرد کە لەکەناری روباری مەعقەل لەسەر پردەکە بەیەزید گەیشت و ئەوی زیندانی و بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز رەوانەی کرد. عومەر بانگی کرد. ئەو یەزید و بنەماڵەکەی بەدوژمن دەزانی و دەیوت: ئەوانە ستەمکارە یاخیەکانن و من کەسانی لەو شێوەم خۆش ناوێت. یەزیدیش ڕقی لەعومەر کوڕی عەبدولعەزیز بو و دەیوت: ریاکارە. کاتێك عومەر هاتە سەرکار، یەزید تێگەیشت کە ئەو لەریاکاری بەدورە. کاتێك عومەر داوای یەزیدی کرد، سەبارەت بەسامانەکانی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد کە پێشتر ئامارەکەی بۆ سلێمان کوڕی عەبدولەلیك نوسیبو. یەزید وتی: من لای سلێمان ئەو پێگەیەم بو کەخۆت دەزانی. لەبەر ئەوە ئاماژەم بەو بڕە سامانەدا تا ناوبانگی ئەو کارە شکۆدارە بەگوێی خەڵکان بگەیێنم چونکە دەمزانی سلێمان لەمبارەوە لێکۆڵینەوە لەگەڵ من ناکات. عومەر پێی وت: سەبارەت بەتۆ هیچ چارەیەکەم نیە مەگەر ئەوەی زیندانیت بکەم، لەخوا بترسە و ئەوەی مافی موسوڵمانان لای تۆیە بیگەرێنەرەوە چونکە من ناتوانم لەوە خۆش ببم.

عومەر ئەوی لەحەلەب زیندانی کرد و جەراح کوڕی عەبداللەی حەکەمی هەڵبژارد و وەك فەرمانداری خوراسان بۆ ئەو دیارە رەوانەی کرد. موخەلید کوڕی یەزید لەخوراسان هاتەدەر و سامانێکی فراوانی لەناو خەڵکان دابەش کرد. دواتر هاتە لای عومەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خوا ئەزمونێکی دیکە بۆ ئەم خەڵکە دیاری کرد کە تۆی کردە فەرمانڕەوایی ئەوان و ئێمە گرفتاری ئەو ئەزمونە بوین. کارێك مەکە ئێمە ببینە بەدبەخترینی خەڵکان لەزیانی فەرمانڕەوایی تۆ. بۆ ئەو پیرە پیاوەت خستۆتە زیندان؟ من قەرزەکەی ئەو لەئەستۆ دەگرم، لەسەر بنەمای پێدانی شتێك

لەگەڵ من رێکبکەوە و هەرچی دەخوازیت داوای بکە. عومەر وتی: نایکەم مەگەر ئەوەی هەموی بدات. موخەلید وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر شایەت یا بەڵگەت هەیە ئەو کارە بکە و وەگەرنە قسەکانی یەزید بەراست بزانە و ئەگەر نەیکرد، لەگەڵ ئەو ئاشتی بکە. عومەر وتی: تەنیا بەگەڕاندنەوەی هەمو سامانەکە رەزامەند دەبم. موخەلید لای عومەر هاتەدەر و عومەر وتی: ئەمە لەباوکی باشترە. موخەلید زۆری نەخایاند کەکۆچی دوایی کرد. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوێژی لەسەر خوێند و وتی: ئەمڕۆ جوامێرەکەی عەرەب مرد. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

بکوا حذيفة لم يبكوا مثله      حتى تبيد خلايق لم تخلق

یانی: بۆ حوزەیفە بگرین کە بۆ کەسی هاوشێوەی ئەو نەگریاون، ئەوەندە بگرین کە ئافرێنراوە نەمرەکان، بەرەو لەناوچون بڕۆن.

کاتێك یەزید رازی نەبو سامانەکان بۆ عومەر بگەڕێنێتەوە، جل وبەرگی پەشیمینی لەبەر کرد و سوار وشتری کرد و وتی: بیبەن بۆ دەهلەك. کاتێك ئەویان بە بەرچاوی خەڵکدا بردەدەر، بەردەوام دەیوت: ئایا من کەس و کار و بنەماڵەم نیە؟ چونکە دز و خراپەکاران بۆ دەهلەك دەبەن. سەلامە کوڕی نەعیمی خەولانی ڕۆشتە لای عومەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، یەزید بۆ زیندان بگەڕێنێرەوە چونکە دەترسم ئەگەر ئەو رەوانە بکەیت، خەڵکەکەی لەدەست پاسەوانەکان رزگاری بکەن چونکە بەتەواوەتی گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی ئەون. عومەر ئەوی بۆ زیندان گەڕاندەوە کە لەزیندان مایەوە تا ئەو کاتەی هەواڵی نەخۆش کەوتنی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز پێ گەیشت.

## لەسەر کارلابردنی جەراح کوڕی عەبداللەو هێنانە سەرکاری عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم

دانانی عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله

دەڵێن: لەم ساڵەدا، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ، جەراح کوڕی عەبداللەی حەکەمی لەفەرمانداری خوراسان لابرد و عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیمی بەشیری لەجێگەکەی ئەو دانا. لەسەر کار لابردنی جەراح لەمانگی رەمەزان/ ئاوریلی ٧١٩ زایینی بو.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك یەزید لەفەرمانداری خوراسان دورخرایەوە، کارگوزاری عێراق کارگوزارێکی بۆ جەرجان دەستنیشان کرد کەجەهم کوڕی زەحری جوعەفی گرت چونکە ئەو کارگوزرای یەزید کوڕی موهەلیب بو لەجەرجان. ئەوی خستە زیندان هەروەها هەمو ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو دابون و دوای ئەوە بەرەو لای جەراح لەخوراسان بەرێکەوت. خەڵکی جەرجان فەرماندارەکەیان ئازاد کرد و جەراح بەجەهمی وت: ئەگەر کوڕە مامم نەدەبوویت، رێگەم بەم کارەی تۆ نەدەدا. جەهم وتی: ئەگەر کوڕە مامم نەدەبویت، نەدەهاتمە لای تۆ.

جەهم ئاوەڵزاوای جەراح بو چونکە هەردوکیان کچی حوصەین کوڕی حارسیان کردبوە هاوسەری خۆیان. بەلأم ئەوەی کەدەڵێن کوڕە مامی یەك بون بەم شێوە بو کە حەکەم و جوعفی کوڕەکانی سەعدی فەشیرین.

جەراح پێی وت: ناسازگاریت لەگەڵ رێبەرەکەت کرد، بەرەو جەنگ بەرێکەوە، ئەگەری هەیە سەرکەوتن بەدەست بێنیت و ئەو لەتۆ خۆش ببێت. ئەوی بۆ شەڕ لەگەڵ خەڵکانی خوتەل رەوانە کرد کە تالأنی لەوان بەدەست هێنا وگەڕایەوە. جەراح دەستەیەکی نوێنەرایەتی بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز رەوانە کرد کە لەدو پیاوی عەرەب و پیاوێك لەموالیەکان بەناوی ئەبو صەید پێکهاتبون. دو عەرەبەکە قسەیان کرد و پیاوی موالی بێدەنگ بو. عومەر وتی: تۆ لەدەستەی نوێنەران نیت؟ وتی: بەڵێ. وتی: بۆ قسە ناکەیت؟ وتی: ئەی سەروەری باوەرداران، بیست هەزار موالی بێ بەخشش و رۆژی شەڕ دەکەن و بیست هەزار کەسی ئەمان بەخشراو باوەڕیان بەئیسلام هێناوە و هێشتا باج دەدەن و بۆ ئەم کارە لەئازار و ڕەنجدان. فەرمانداری ئێمە پیاوێکە تەنیا

لەگەڵ من رێکبکەوە و هەرچی دەخوازیت داوای بکە. عومەر وتی: نایکەم مەگەر ئەوەی هەموی بدات. موخەلید وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر شایەت یا بەڵگەت هەیە ئەو کارە بکە و وەگەرنە قسەکانی یەزید بەراست بزانە و ئەگەر نەیکرد، لەگەڵ ئەو ئاشتی بکە. عومەر وتی: تەنیا بەگەڕاندنەوەی هەمو سامانەکە رەزامەند دەبم. موخەلید لای عومەر هاتەدەر و عومەر وتی: ئەمە لەباوکی باشترە. موخەلید زۆری نەخایاند کەکۆچی دوایی کرد. عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوێژی لەسەر خوێند و وتی: ئەمرۆ جوامێرەکەی عەرەب مرد. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

بکوا حذيفة لم يبكوا مثله حتى تبيد خلايق لم تخلق

یانی: بۆ حوزەیفە بگرین کە بۆ کەسی هاوشێوەی ئەو نەگریاون، ئەوەندە بگرین کە ئافرێنراوە نەمرەکان، بەرەو لەناوچون بڕۆن.

کاتێك یەزید رازی نەبو سامانەکان بۆ عومەر بگەرێنێتەوە، جل وبەرگی پەشیمینی لەبەر کرد و سوار وشتری کرد و وتی: بیبەن بۆ دەهلەك. کاتێك ئەویان بە بەرچاوی خەڵکدا بردەدەر، بەردەوام دەیوت: ئایا من کەس و کار و بنەماڵەم نیە؟ چونکە دز و خراپەکاران بۆ دەهلەك دەبەن. سەلامە کوڕی نەعیمی خەولانی رۆشتە لای عومەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، یەزید بۆ زیندان بگەرێنێرەوە چونکە دەترسم ئەگەر ئەو رەوانە بکەیت، خەڵکەکەی لەدەست پاسەوانەکان رزگاری بکەن چونکە بەتەواوەتی گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی ئەون. عومەر ئەوی بۆ زیندان گەڕاندەوە کە لەزیندان مایەوە تا ئەو کاتەی هەواڵی نەخۆش کەوتنی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز پێ گەیشت.

## لەسەر کارلابردنی جەراح کوڕی عەبدالله و هێنانە سەرکاری

# عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم

### دانانی عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله

دەڵێن: لەم ساڵەدا، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ، جەراح کوڕی عەبدالله‌ی حەکەمی لەفەرمانداری خوراسان لابرد و عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیمی بەشیری لەجێگەکەی ئەو دانا. لەسەر کار لابردنی جەراح لەمانگی رەمەزان/ ئاوریلی ٧١٩ زایینی بو.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك یەزید لەفەرمانداری خوراسان دورخرایەوە، کارگوزاری عێراق کارگوزارێکی بۆ جەرجان دەستنیشان کرد کەجەهم کوڕی زەحری جوعەفی گرت چونکە ئەو کارگوزرای یەزید کوڕی موهەلیب بو لەجەرجان. ئەوی خستە زیندان هەروەها هەمو ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو دابون و دوای ئەوە بەرەو لای جەراح لەخوراسان بەڕێکەوت. خەڵکی جەرجان فەرمانداره‌کەیان ئازاد کرد و جەراح بەجەهمی وت: ئەگەر کوڕە مامم نەدەبوییت، رێگەم بەم کارەی تۆ نەدەدا. جەهم وتی: ئەگەر کوڕە مامم نەدەبویت، نەدەهاتمە لای تۆ.

جەهم ئاوەڵزاوای جەراح بو چونکە هەردوکیان کچی حوصەین کوڕی حارسیان کردبوە هاوسەری خۆیان. بەڵام ئەوەی کەدەڵێن کوڕە مامی یەك بون بەم شێوە بو کە حەکەم و جوعفی کوڕەکانی سەعدی قەشیرین.

جەراح پێی وت: ناسازگاریت لەگەڵ رێبەرەکەت کرد، بەرەو جەنگ بەرێکەوە، ئەگەری هەیە سەرکەوتن بەدەست بێنیت و ئەو لەتۆ خۆش ببێت. ئەوی بۆ شەڕ لەگەڵ خەڵکانی خوتەل رەوانە کرد کە تالانی لەوان بەدەست هێنا وگەڕایەوە. جەراح دەستەیەکی نوێنەرایەتی بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز رەوانە کرد کە لەدو پیاوی عەرەب و پیاوێك لەموالیەکان بەناوی ئەبو صەید پێکهاتبون. دو عەرەبەکە قسەیان کرد و پیاوی موالی بێدەنگ بو. عومەر وتی: تۆ لەدەستەی نوێنەران نیت؟ وتی: بەڵێ. وتی: بۆ قسە ناکەیت؟ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بیست هەزار موالی بێ بەخشش و رۆژی شەڕ دەکەن و بیست هەزار کەسی ئەمان بەخشراو باوەڕیان بەئیسلام هێناوە و هێشتا باج دەدەن و بۆ ئەم کارە لەئازار و رەنجدان. فەرمانداری ئێمە پیاوێکە تەنیا

پارێزگاری لەخەڵکەکەی خۆی دەکات و ستەمکارانە بەرگری لەوان و ستەم لەئێمە دەکات و دەڕواتە سەر تەختی وتاردان و دەڵێت: کاتێك هاتمە لای ئێوە کەسێکی مێهرەبان بەڵام ئێستاکە تورە و بێ بەزەییم. سوێند بەخوا یەك کەس لەخەڵکەکەی خۆم باشتر لەسەد کەس لەکەسانیترە و زیاتر ئەوانم خۆش دەوێت. ئەم فەرمانداره، شمشێرێك لەشمشێرەکانی حەجاجە کە بەستەمکاری فەرمانڕەوایەتی کردوە. عومەر وتی: کەسێکی وەك تۆ شیاوە ببێتە نوێنەر.

عومەر نامەی بۆ جەراح نوسی: سەیری خەڵکانی دەوروبەری خۆت بکە و هەر کەس روو لەقیبلە نوێژ دەخوێنێت، باجی لێ وەرمەگرە. خەڵکان بەخێرایی باوەڕیان بەئیسلام هێنا. بەجەراحیان وت: خەڵك لەترسی باج باوەڕیان بەئیسلام هێناوە، ئەوان بەخەتێنە کردن تاقی بکەرەوە. جەراح هەواڵی ئەم کارەی بۆ عومەر نوسی. عومەر وەڵامی دایەوە: خوا محەممەدی وەك نێردراو رەوانە کردوە نەك وەك کەسێکی خەتێنەکەر. دوبارە عومەر وتی: پیاوێکی راستگۆ بێننە لای من کە سەبارەت بەخوراسان بەراستی قسە بێنێتە سەرزمان. پێیان وت: داوای ئەبو مێجلەز بکە. عومەر بۆ جەراحی نوسی: وەرە بۆ لای من و ئەبو مێجلەز لەگەڵ خۆت بێنە و کاروباری تایبەت بەشەڕ لەخوراسان بە عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیمی عامری بسپێرە. جەراح ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و وتی: ئەی خوراسانیەکان، بەم جلّ و بەرگانەی بەرم و بەئەسپەکەی خۆم هاتمە لای ئێوە و لەسامانی ئێوە جگە لەم شمشێرەم هەڵنەگرتوە. لای ئەو جگە لەئەسپ و ئێسترێك هیچی دیکە نەدەبینرا. بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە لای عومەر، عومەر لێی پرسی: کەی بەرێکەوتیت؟ وتی: لەمانگی رەمەزان. عومەر وتی: راستی کرد ئەو کەسەی تۆی بەبێمێشك و بێ ئاوز ناساند، بۆ نەمایتەوە تا ڕۆژوەکانت بگریت و دواتر بەرێکەویت.

پێشتر جەراح بۆ عومەری نوسیبو: من هاتمە خوراسان و کەسانێکم بینی کە ئاژاوە نانەوە ئەوانی سەرخۆش کردوە و ئێستا خۆشەویسترین کار لای ئەوان ئەوەیە کەسنورەکانی خواوەند ببەزێنن، جگە لەشمشێر و قامچی هیچ شتێك رێگەی ئەم کارەیان لێ ناگرێت بەڵام حەزم نەدەکرد بەبێ فەرمانی تۆ هیچ کارێك بکەم. عومەر بۆی نوسی: ئەی کوڕی دایکی جەراح، تۆ بۆ ئاژاوە بەتەماحتر لەوانیت، هیچ خواپەرەست

یا ئەمان بەخشراوێك بەبێ هۆ نەدەیتە بەرقامچی، لەسزاكان بترسە چونكە بۆ لای خواوەندێك دەگەرێیتەوە كە ئاگای لەپێلو خستنە سەریەكی چاوەكانە و بەنهێنی دڵەكان دەزانێت، دۆسیەكەی خۆت دەخوێنیتەوە و دەبینیت ( هیچ ورد و بچوكێك لەقەڵەم ناخات مەگەر ئەوەی حسێبیان بۆ دەكات) كەهف/ ١٨/ ٤٩.

كاتێك جەراح ڕۆشتە لای عومەر و ئەبو مێجلەزیش لەگەڵیدابو، عومەر پێی وت: من لە عەبدولرەحمان كوڕی عەبدالله ئاگادار بكەرەوە. وتی: پاداش بەپیاوە تێكۆشەرەكان دەدات، سزای دوژمنان دەدات، هەركارێك بیەوێت ئەنجامی دەدات و ئەگەر یار و هاوەڵی لەپشت بێت، هەنگاو بۆ پێشەوە دەبات. وتی: ئەی عەبدولرەحمان كوڕی نوعەیم؟ وتی: ئارەزومەندی ئارامی و چاوڕوانیە و من خۆشم دەوێت. عومەر ئەوی كردە لێپرسراوی نوێژ و كاروباری تایبەت بەجەنگ و عەبدولرەحمان قەشیری كردە سەرپەرەستی كۆكردنەوەی باج و نامەی بۆ خەڵكی خوراسان نوسی: من عەبدولرەحمان بۆ كاروباری تایبەت بەجەنگ و عەبدولرەحمان كوڕی عەبداللەم بۆ كۆكردنەوەی باج دەستنیشان كرد. فەرمانی ئەو كارەی بۆ ئەو دوانە نوسی و پێشنیاری چاكەكاری پێكردن.

عەبدولرەحمان كوڕی نوعەیم لەخوراسان بو تا كاتێك كە عومەر كوڕی عەبدولعەزیز مرد و دوای ئەو یەزید كوڕی موهەلیب گوژرا و مەسلەمە كوڕی عەبدولعەزیز، حارس كوڕی حەكەمی رەوانە كرد. فەرمانڕەوایی ئەو زیاتر لەساڵ و نیوێكی خایاند.

## دەسپێکی بانگەوازی عەباسیەکان

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عەباس مژدەدەرانی بۆ هەمو سوچ و کەنارەکان رەوانە کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە محەممەد لەسەرزەمینی شەرات لەسنوری فەرمانڕەوایەتی بەلقای شام ژیانی بەسەر دەبرد. ئەبو هاشم عەبداللە کوڕی محەممەد کوڕی حەنیفە لەشام ڕۆشتە لای سلێمان و محەممەد کوڕی عەلی لەگەڵ ئەو کۆبویەوە و رێزی لێگرت. ئەبو هاشم ڕۆشتە لای سلێمان و ئەویش رێزی لێگرت و نیازەکانی بەراوەردە کرد. لەزانست و زمان پاراوی ئەو شتی زۆری بینی کەرژدی پێبرد و لێی ترسا و لەبەر ئەمە کەسێکی دیاری کرد کە لەسەر رێگەکەی دانیشت و شیری ژەهراوی دەرخوارددا.

کاتێك ئەبو هاشم هەستی بەزیانەکەی کرد، مەبەستی ڕۆشتن بۆ حومەیمە لەپانتاییەکانی شەراتی کرد کەمحەممەد لەوێ بو. لای ئەو دابەزی و ئاگاداری کردەوە کە خەلافەت بەمنداڵەکانی ئەو دەگات و ئامۆژگاری کرد تا کاروبارەکانی راپەڕێنێت. ئەبو هاشم شوێنکەوتەکانی خۆی لەخەڵکانی خوراسان و عێراقی ئاگادار کردەوە کە خەلافەت بەبنەماڵەی محەممەد کوڕی عەلی دەگات. فەرمانی پێدان دوای ئەو شوێن ئەم بکەون.

کاتێك ئەبو هاشم مرد، لەدەوری محەممەد کۆبونەوە و پەیمانیان لەگەڵ بەست و گەڕانەوە و خەڵکیان بۆ شوێنکەوتنی ئەو هاندا. خەڵك رازی بون. نێردراوەکانیان بۆ کەنارەکان رەوانە کرد: مەیسەرە بۆ عێراق و محەممەد کوڕی خونەیس و ئەبو عێکرەمە و حەیانی عەتار خاڵی ئیبراهیم کوڕی سەلیمە بۆ خوراسان رەوانە کرد کە جەراحی حەکەمی فەرمانڕەوایەتی دەکرد. فەرمانی پێدان پێشنیاری رێبەرایەتی ئەو و بنەماڵەکەی بەخەڵکان بکەن. چاویان بەکەسانێك کەوت و بەنامەی ئەو کەسانەی وەڵامی بانگەوازەکەیان دابویەوە، رویان لەمحەممەد کوڕی عەلی کرد و تەسلیمی مەیسەرەیان کرد کە بۆ محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عەباسی رەوانە کرد. ئەبو محەممەد صادق بۆ محەممەد کوڕی عەلی دوانزە پیاوی لەگەورەکان هەڵبژارد و لەناو ئەوان: سلێمان کوڕی کەسیری خوزاعی، لاهیز کوڕی قورەیزی تەمیمی، قەحتەبە کوڕی شەبیبی تایی، موسا کوڕی کەعبی تەمیمی، خالید کوڕی ئیبراهیم ئەبو داوود

لەشەیبان کوڕی زوهەل، قاسم کوڕی موجاشعی تەمیمی، عیمران کوڕی ئیسماعیل ئەبو ئەلنەجم موالی بنەماڵەی ئەبو موعیت، مالك کوڕی هەیسەمی خوزاعی، تەڵحە کوڕی زورەیقی خوزاعی، عەمرۆ کوڕی ئەعیەن ئەبو حەمزە موالی خوزاعە، شیبل کوڕی تەهمان ئەبو عەلی هێرەوی موالی بەنی حەنیفە و عیسا کوڕی ئەعیەن موالی خوزاعە. حەفتا پیاوی هەڵبژارد کە محەممەد کوڕی عەلی نامەی بۆ نوسین تا نمونەی کارەکانیان بێت و بەشێوازێك لەقەڵەم بدرێت تا بەو پێیە کاروبارەکانیان ئەنجام بدەن.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز فەرمانی بەخەڵکی تەرەندە دا لەماڵت پاشەکشێ بکەن. تەرەندە لەقولاییەکانی سەرزەمینی رۆمدایە و لەماڵتەوە سێ فەرسەخ دورە. عەبدالله کوڕی عەبدولمەلیك لەساڵی ٧٠٢/٨٣ زایینی لەوێ شەڕ و موسوڵمانانی لەوێ نیشتەجێ کرد. لەم کاتەدا شاری ماڵت وێرانە بو. سوپاییەکان لەجەزیرەوە دەهاتنە لای ئەوان تا کاتی بەفر بارین و دواتر دەگەڕانەوە. بەم شێوەیە بو تا ئەوەی عومەر هاتە سەر کار و فەرمانی پێدان بۆ ماڵت بگەڕێنەوە. لەترسی دوژمنان تەرەندەی چۆڵ و وێرانی کرد و جەعونە کوڕی حارس پیاوێك لەبەنی عامر کوڕی صەعصەعەی کردە فەرمانداری ماڵت.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بۆ پاشاکانی سند نامەی نوسی و پێشنیاری ئیسلامی پێکردن لەسەر ئەو بنەمای کە پاشای ولاتەکانی خۆیان بن و ئەوەی لەسەر موسوڵمانانە پێویستە لەسەر ئەوانیش پێویست و ئەوەی تایبەت بە موسوڵمان بێت، تایبەت بەوانیش بێت. عومەر بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی دەکرد. جەبیشە کوڕی زاهر باوەڕی بەئیسلام هێنا و پاشاکان خۆیان بەناوە عەرەبیەکان ناساند. عومەر، عەمرۆ کوڕی موسلیم برای قوتەیبە کوڕی موسلیمی وەك کارگوزاری ئەو ناوچەیە دەست نیشان کردبو. ئەو هێرشی کردە سەر چەندین بەشی هندستان و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و پاشاکانی سند کە باوەڕیان بەئیسلام هێنابو لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی عومەر و یەزید کوڕی عەبدولمەلیك فەرمانڕەوایەتی ولاتەکانی خۆیان کرد و کاتێك رۆژگاری هوشام گەیشت، لەئیسلام هەڵگەڕانەوە کە بەخواستی خوای گەورە ئاماژە بەهۆکارەکانی دەدەین.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، عومەر کوڕی هوبەیرەی فەزاری کردە فەرمانداری جەزیرە.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز وەلید کوڕی هشام موعیتی و عەمرۆ کوڕی قەیسی کێندی بۆ شەڕی هاوینە رەوانە کرد.

ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ لەم ساڵەدا حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. فەرماندارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشو بون کەپێشتر ئاماژەیان پێدرا جگە لەکارگوزاری خوراسان. فەرماندە کاروباری تایبەت بەجەنگ لەخوراسان عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم و سەرپەرەستی کۆکردنەوەی باج عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللە بون (لەکۆتاییەکانی ئەم ساڵەدا).

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، ئیسماعیل کوڕی عەبداللە موالی بەنی مەخزومی کردە فەرمانداری ئەفریقیە و سەمح کوڕی مالکی خەولانی کردە فەرمانداری ئاندۆلۆس. لەرۆژگاری عەبدولمەلیك ئەمانەت و باوەڕداری ئەوی بۆ سەلمێنرابو و لەبەر ئەمە وەك فەرماندار دەست نیشانی کرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەبو توفەیل عامر کوڕی وایلە لە مەککە (ئەو دوایین کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بو کەمرد) شەهر کوڕی حوشب کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١١٢/ ٧٣٠ زایینی مرد، قاسم کوڕی موخەیمیرەی هەمەدانی، موسلیم کوڕی یەساری فەقیە کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٠١/ ٧١٩- ٧٢٠ مرد، ئەبو ئەمامە ئەسعەد کوڕی سەهل کوڕی حونەیفە لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بو و پێغەمبەر(د.خ) ناوی لێنا، بوسر کوڕی سەعد موالی حەزرەمیەکان، عیسا کوڕی تەڵحە کوڕی عەبداللەی تەمیمی، محەممەد کوڕی جوبەیر کوڕی موتعم، رێبعی کوڕی حەراشی کوفی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٠٤/ ٧٢٢ زایینی مرد، حەنش کوڕی عەبداللەی صەنعانی لەهاوەڵانی عەلی کە کاتێك عەلی کوژرا، حەنش بۆ میسر کۆچی کرد و یەکەم کەس بو مزگەوتی گەورەی سەرقستەی لەئاندۆلۆس دروست کرد.

## روداوەکانی ساڵی سەد و یەکی کۆچی (٧١٩- ٧٢٠ زایینی)

## هەڵاتنی کوڕی موهەلیب

پێشتر ئاماژەمان بەچەنیەتی زیندانی کرانی یەزید کوڕی موهەلیبدا. ئەو لەزیندان مایەوە تا ئەو کاتەی نەخۆشیەکەی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز گران بو. لەم کاتەدا بیری لەرێگەی هەلاتن کردەوە. لەیەزید کوڕی عەبدولمەلیك ترسا چونکە ئەو بنەماڵەی ئەبو عەقیلی ئەشکەنجە کردبو. دایکی حەجاج (کچی محەممەد کوڕی یوسف برای حەجاج کوڕی یوسف) ژنی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بو.

هۆکاری ئەشکەنجە کردنی ئەوان ئەوە بو کاتێك سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك بو بەخەلیفەی موسوڵمانان، بنەماڵەی ئەبو عەقیلی گرت و بەیەزید کوڕی موهەلیبی سپارد تا سامانەکانیان لێ وەربگرێتەوە. یەزید ئەوانی ئەشکەنجە کرد وکەسانی بەرەو بەلقا ء(لەدەوروبەری دیمەشق) رەوانە کرد کە گەنجی حەجاج کوڕی یوسف و ژن و منداڵەکانی لەوێ بون. ئەوانیان لەگەڵ سامانەکان بردە لای یەزید. یەکێك لەوان دایکی حەجاج (ژنی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك )بو. دەستەیەك دەڵێن: نە، ئەو خوشکی بو. داوایان لەیەزید کوڕی عەبدولمەلیك کرد تا لای یەزید کوڕی موهەلیب نێوەنجیگەری بکات، یەزید بۆ ئەم کارە ڕۆشتە ماڵی کوڕی موهەلیب و داوای بەخشینی ئەوانی کرد. یەزید کوڕی موهەلیب بەداواکەی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك رازی نەبو. یەزید کوڕی عەبدولمەلیك وتی: ئەوەی داوای دەکەیت، لەئەستۆی دەگرم. کوڕی موهەلیب رازی نەبو. یەزید پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر جڵەوی کاروبارەکان بگرمە دەست، یەکێك لەئەندامانی جەستەی تۆ دەبڕم! کوڕی موهەلیب وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ببیتە خەلیفە، سەد هەزار شمشێروەشێن بۆ شەڕی تۆ کۆدەکەمەوە. یەزید کوڕی عەبدولمەلیك ئەوەی لەئەستۆی ئەو ژنەدا بو، (نزیکەی سەد هەزار دینار) لەئەستۆی گرت. دەستەیەك دەڵێن: پێش ئەوە بو.

کاتێك نەخۆشیەکەی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز روی لەدژواری کرد، کوڕی موهەلیب لەیەزید کوڕی عەبدولمەلیك ترسا و کەسی بۆ لای هاورێکانی خۆی رەوانە کرد کە وشتر و ئەسپیان بۆ ئامادە کرد و شوێنێکیان دیاری کرد تا لەوێ بڕواتە لای ئەوان.

بۆ فەرمانداران حەلەب و پاسەوانەکانی زیندانی خۆی زێر و زیوی ڕەوانە کرد و وتی: سەروەری باوەڕداران نەخۆش کەوتوە و هیوایی چاکبونەوەی لێ ناکرێت، ئەگەر یەزید بێتە سەر کار خوێنی من دەڕێژێت. ئەویان لەزیندان هێنایە دەر کە بۆ شوێنی دیاریکراو لای هاورێکانی هەلات. سوارچوارپێکان بو و مەبەستی ڕۆشتن بۆ بەسرەی کرد و نامەی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نوسی و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر هیوام بەچاکبونەوەی تۆ دەبو، لەزیندان هەڵنەدەهاتم بەلام ترسام یەزید بێتەسەر کار و بەناخۆشترین شێوە بمکوژێت. نامەکە کاتێك بەدەستی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز گەیشت کەبەقورسی هەناسەی دەکێشا. عومەر وتی: ئەی خوایە ئەگەر زیانی موسوڵمانانی دەوێت، ئەو پەیوەستی مەرگ بکە و گیانی بڕەنجێنە چونکە گیانی منی ڕەنجاند.

یەزید کوڕی موهەلیب لەسەر ڕێگەی خۆی لای هوزەیل کوڕی زوفەر کوڕی حارس تێپەری کە لێی دەترسا. هوزەیل نەکەوتبوە خۆ کە یەزید ڕۆشتە ناو ماڵەکەی و داوای شیری کرد و خواردی. هوزەیل شەرم دایگرت و پێشنیاری ئەسپ و شتی دیکەی پێکرد کە یەزید وەرینەگرت.

سەبارەت بەترسی کوڕی موهەلیب لەیەزید کوڕی عەبدولەلیك ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەداوە کە بەخواستی خوا لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

## مردنی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز

دەڵێن: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەمانگی رەجەبی ساڵی ١٠١/ ژانویەی ٧٢٠ زایینی کۆچی دوایی کرد. نەخۆشیەکەی بیست و چەند رۆژی خایاند. کاتێك نەخۆش کەوت پێیان وت: باشترە دەرمانی خۆت بکەیت. وتی: ئەگەر بزانم نەخۆشیەکەم بەخواردنی گوێچکەم چاك دەبێتەوە، گوێچکەم ناخورێنم. باشترین شوێن لای خواوەندە کە بەرەو لای ئەوێ کۆچ دەکەم. ئەو لە خانەقای سەمعان یا خوناسرە بو کەمرد و لەسەمعان بەخاکیان سپارد. ماوەی خەلافەتی دو ساڵ و پێنج مانگ درێژەی کێشا و ساڵەکانی تەمەنی ٣٩ ساڵ و چەند مانگ یا ٤٠ ساڵ و چەند مانگ. نازناوەکی ئەبو حەفص بو و پێیان دەوت (سەرشکاوی ئومەوییەکان) چونکە لەمناڵیدا یەکێك لەچوارپێکانی باوکی لەقەی لەسەریدا و شکاندی. کوڕ رۆشتەی لای دایکی. دایك دڵنەوایی دایەوە و سەرکۆنەی باوکی کرد لەبەر ئەوەی پەرەستاری بۆ کوڕەکەی دیاری نەکردوە. عەبدولعەزیز پێی وت: دایکی عاصم، بێدەنگ بو و خۆزگەم بەحاڵی تۆ ئەگەر کوڕەکەت سەرشکاوی ئومەوییەکان بێت.

مەیمون کوڕی مێهران دەڵێت: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەیوت: کاتێك وەلیدم بەخاك سپارد، کفنم لەروخساری هەڵگرت و بینیم رووی رەش بوە. کاتێك مردم و بەخاکت سپاردم، سەیری روخسارم بکە بزانە چی دەبینیت. مەیمون دەڵێت: ئەو کارەم کرد و روخساریم بەگەشتر بینی لەو کاتانەی هێشتا لەژیاندا بو.

دەڵێن: عەبداللە کوڕی عومەر دەیوت: خۆزگە دەمزانی چ کەسێك لەبنەماڵەی عومەر نیشانەیەك بەروخساریەوە هەیە و زەوی لێوانلێو دەکات لەدادپەروەری.

دایکی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دایکی عاصم کچی عاصم کوڕی عومەری خەتاب بو. نەژادی عومەر بەم شێوە بو: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی مەروان کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص کوڕی ئومەییە. شاعیرەکان سەبارەت بەمەرگی ئەو چەندین شێعریان هۆنیەوە کە لەناویاندا کەسیری عێزەت وتی:

اقول لما اتانی ثم مهلکه: لا تبعدن قوام الحق و الدين

قد غادروا فی ضریح اللحد منجدلا          بدیر سمعان قسطاس الموازین

یانی: کاتێك لەوێ بوم و هەواڵی مەرگی ئەوم بیست، وتم: دور نەبێت کۆڵەکەی دین و راستی و دروستی، لەژێر کێلی ئارامگا و لە خانەقای سەمعان جێگەی پیاوێکیان کردۆتەوە کە شایەنی راستگۆی ئەندازەگرتنەکان بو.

جەریر و فەرزدق و کەسانیتریش شێعریان بۆ پرسەی ئەو هۆنیوەتەوە.

## کاروکردوەکانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز

دەڵێن: کاتێك بو بەخەلیفە، نامەی بۆ یەزید کوڕی موهەلیب نوسی: دوای سلاو، سلێمان کوڕی عەبدولەلیك بەندەیەك لەبەندەکانی خوا بو کە خوای ئەوی بەخشی و بۆ لای خۆی بردەوە و دەرگایی پاشایەتی بەرووی مندا ئاوەلا کرد و دوای من یەزید کوڕی عەبدولەلیك. ئەوەی خوا منی بۆ دەستنیشان کردوە، بۆ من ئاسان نیە. ئەگەر ئارەزومەندی ژن و سامان دەبوم، لەوەی بەمنی بەخشیوە، باشترین کەڵکم وەردەگرت کە هەرکام لەئافرێنراوەکانی وەریانگرتوە. من لەم کارەی کە بەهۆیەوە تاقی دەکرێمەوە، لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەیەکی دژوار دەبینم مەگەر ئەوەی خوا بمبەخشێت. ئەو کەسانەی لای من بون بەیعەتیان کردوە. دەبێت لەکەسانی دەوروبەری خۆت بەیعەت وەربگریت.

کاتێك نامەکەی خوێندەوە: پێیان وت: لەکارگوزارانی ئەو نیت چونکە وتارەکەی لەوتاری کەسانی پێشوی بنەماڵەکەی ناچێت. یەزید داوای لەخەڵك کرد بەیعەت ببەستن کە هەموان بەیعەتیان کرد.

موقاتیل کوڕی حەیان دەڵێت: عومەر نامەی بۆ عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم نوسی و وتی: دوای سلاو، هاوشێوەی کەسێك هەڵس و کەوت بکە کەدەزانێت خوا کردەوەی خراپەکاران نابەخشێت.

توفەیل کوڕی مێرداس دەڵێت: عومەر بۆ سلێمان کوڕی ئەبی سری نامەی نوسی: کاروان سەراکان دروست بکە و ئەو موسوڵمانانەی لای تۆوە تێدەپەڕن بۆ شەو و رۆژێك میوانداریان بکە و هەر کەس نەخۆشە، دو شەو و رۆژ و ئەگەر لەرێگە بەجێ مابێت، پەیوەستی بنەماڵە و کەسەکانی بکە. کاتێك نامەکەی عومەری بەدەست گەیشت، خەڵکی سەمەرقەند پێیان وت: قوتەیبە ستەمی لە ئێمە کرد و پەیمانەکەی ئێمەی خستە

ژێرپێ و وبەزۆر ولأتەکەمانی لەدەست دەرهێناین و تۆوی ستەمکاری چاند. ئێستا خوا دادپەروەری بلأو کردۆتەوە. داوای فەرمانێك بکە تا دەستەیەك لەنوێنەرەکانمان بڕۆنە لای. ئەو داوای فەرمانی بۆ کردن و دەستەیەکی بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ڕەوانە کرد. عومەر سەبارەت بەوان فەرمانی بۆ سلێمان کوڕی ئەبی سری نوسی: خەڵکی سەمەرقەند لەستەمکاری و خراپەکاری سلێمان سکالأ دەکەن کە بەزۆر ئەوانی لەسەرزەمینەکەیان دەرپەڕاندوە. کاتێك نامەکەی من بەدەستی تۆ دەگات، کەسێك وەك داوەر دەستنیشان بکە تا لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانیان بکات، ئەگەر لەبەرژەوەندی ئەوان داوەری کرد عەرەبەکان بۆ ناو لەشکرگەکان بگەڕێنەرەوە بەهەمان شێوە کەپێش زاڵبونی قوتەیبە بەسەر سەمەرقەند لەناو لەشکرگەکاندا دەژیان. دەڵێت: سلێمان، جومەیع کوڕی حازری داوەری دەست نیشان کرد کەفەرمانیدا عەرەبەکانی سەمەرقەند بۆ ناو لەشکرگەکەیان دوربخەنەوە و بەشێوەیەکی بەرابەر شەڕیان لەگەڵ بکەن و پەیمانێکی تازە بێت یا سەرکەوتنێکی دیکە بەزۆری شمشێر. خەڵکانی سەغد وتیان: بەم بڕیارە ڕازین و شەڕێکی دیکە دەست پێناکەین. هەموان بەو بڕیارە ڕازی بون.

داوود کوڕی سلێمانی جوعەفی وتی: عومەر بۆ عەبدولحەمید نامەی نوسی: دوای سلأو، کوفیەکان گرفتاری ئەزمون و سەختی و ستەمکاری بون و فەرمانەکانی خواوەندیان سەبارەت بەوان ئاوەژۆ کردوە و فەرمانڕەواکان شێوەیەکی قێزەونیان سەقامگیر کردوە. کۆڵەکەی بنچینەی دین، دادپەروەری و چاکەکاریە. هیچ شتێك گرانباییتر لەکردوەکانت نەبێت چونکە گوناحەکەی ناتوانی بەکەمبایی لەقەڵەم بدەیت. شوێنە ئاوەدانەکان وێران مەکە و ناوچەکان ببوژێنەرەوە و ئەوەندەی لێ وەربگرە کە بەرگەی بگرێت. لەشوێنە ئاوەدانەکان تەنیا باج وەربگرە کەدەبێت مێهرەبانی و ئارامی خەڵکی لەگەڵدا بێت. کرێی سکەلێدەرەکان وەرمەگرە، نەدیاریەکانی نەورۆز، نە جەژنی مێهرگان، نەبەهای نوسراوەکان، نە کرێی وڵات گرتنەکان، نەکرێی ماڵەکان و نە پارەی هاوسەرگیری وەرمەگرە. لەوکەسانەی باوەڕیان بەئیسلام هێناوە، باج مەستێنە. لەم کارانە فەرمانەکانی من جێبەجێ بکە چونکە تۆم بۆ کارێك دەستنیشان کردوە کە خوا فەرمانی پێکردوم. لەبڕینی دەست وپێ و کوشتن پەلە مەکە تا من لەچۆنیەتی کارەکان ئاگادار بکەیتەوە. هەر کەس لەمناڵەکانی ئەو شارە دەیەوێت بەرەو حەج بەرێکەوێت،

سەد درەم یا دیناری پێ ببەخشە تا حەجەکەی بکات. ماڵئاوا.

عوسمان کوڕی عەبدولحەمید دەڵێت:باوکم وتی کە فاتیمە کچی عەبدولمەلیك ژنی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، وتی: کاتێك عومەر نەخۆش کەوت، شەوێك بەتەواوی نائارام بو. ئێمە تا بەیانی بەئاگا ماینەوە. کاتێك بەیانی داهات، فەرمانم بەپەرستارێك بەناوی مەرسەد دا لای ئەو بمێنێتەوە تا ئەگەر نیازێکی بو بەراوەردەی بکات. دواتر خەوتین. کاتێك هەتاو گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان، هەستام و ڕۆشتمە لای بەلأم بینیم مەرسەد لەدەرەوەی ماڵەکە خەوتوە. وتم: بۆ هاتیتە دەر؟ وتی: عومەر منی کردەدەر و پێی وتم: کەسێك دەبینم کە نەلەخەڵکانە و نە لەپەریەکان. هاتمەدەر و بینیم ئەم ئایە دەخوێنێت: ئەو دنیا تایبەت دەکەین بەکەسانێك کە خوازیاری ستەمکاری و یاخیگەری نەبن لەم دنیا. و ئەنجامی تایبەتی خۆپارێزانە (قصص/ ٢٨/ ٨٣) دەڵێت: ڕۆشتمە ژوور و بینیم دوای ڕۆشتنەدەرەوەی من بەرەو قیبلە سوڕاوە و مردوە.

مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك دەڵێت: لەکاتی نەخۆشی ڕۆشتمە سەردانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز. کراسەکەیم بەچڵکن بینی و بەهاوسەرەکەیم وت: کراسەکەی سەروەری باوەڕداران بشۆن. وتی: ئەو کارە دەکەین. گەڕامەوە و بینیم کراسەکەی وەك خۆیەتی. وتم: مەگەر فەرمانم نەدا کراسەکەی بشۆن؟ ژنەکەی وتی: سوێند بەخوا تەنیا ئەو کراسەی هەیە. دەڵێن: پارەی ڕۆژانەی تەنیا دو درەم بو.

دەڵێن: عەبدولعەزیز کوڕەکەی بۆ مەدینە ناردبو تا زانستەکان فێر ببێت. نامەی بۆ ساڵح کوڕی کەیسان نوسی تا سەرپەرەستی عومەر بگرێتە ئەستۆ. ڕۆژێك عومەر لەنوێژ دواکەوت و درەنگی کرد. وتی: بۆ درەنگت کرد؟ وتی: ژنی سەرتاش قژی بۆ چاك دەکردم. ئەو ئەم هەواڵەی بۆ باوکی نوسی. باوکی نێردراوێکی رەوانە کرد و مایەوە تا سەری عومەری تاشی.

محەممەد کوڕی عەلی باقر (ئیمامی پێنجەمی شیعەکان) دەڵێت: هەر خەڵکێك نەژادێکیان هەیە و نەژادی ئومەوییەکان عومەر کوڕی عەبدولعەزیزە کە لەرۆژی هەستانەوە وەك نەتەوەیەك حەشر دەکرێت.

موجاهید دەڵێت: ڕۆشتین تا زانستەکان فێری عومەر بکەین، ئەوەندەی نەخایاند ئەو زانستەکانی فێری ئێمە دەکرد.

مەیمون دەڵێت: زاناکان لەبەرابەر عومەر زانستخواز بون. بەعومەر وترا: سەرەتایی خۆپارێزی تۆ چۆن بو؟ وتی: رۆژێك مەبەستی ئەوەم کرد لەکۆیلەیەك بدەم، بەمنی وت: لەو شەوە بترسە کە بەیانیەکەی رۆژی هەستانەوە بێت. هەروەها عومەر وتی: لەو کاتەوەی زانیم درۆ زیان بە درۆکەر دەگەیەنێت، چیتر درۆم نەکرد.

ریاح کوڕی عوبەیدە دەڵێت: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتەدەر و پیرەپیاوێك پشتی بەدەستی ئەو بەستبو. کاتێك لەکارەکەی تەواوبو و رۆشتەژوور، وتم: خوا سەروەری باوەڕداران بپارێزێت، ئەو پیرە پیاوە کێ بو پشتی بەدەستی تۆ بەستبو؟ وتی: ئەوت بینی؟ وتم: بەڵێ. وتی: ئەو خزری برام بو کە ئاگاداری کردمەوە دەبمە فەرمانڕەوایی ئەم خەڵکە و دادپەروەری دەکەمە پیشە.

دەڵێت: چوارپێ تایبەتەکانی خەلیفەیان بردە لای عومەر و داوای کاو و جۆیان کرد. عومەر فەرمانیدا کە ئەوانیان فرۆشت و بەهاکەیان تەسلیمی گەنجینە کرد. وتی: من ئێسترەکەی خۆمم بەسە. دەڵێت: کاتێك لەرێ و رەسمی بەخاك سپاردنی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك گەڕایەوە، کۆیلەکەی ئەوی بەخەمبار بینی و لەهۆکارەکەی پرسی: عومەر وتی: هیچ کام لە ئۆمەتی محەممەد لەرۆژهەلآت و رۆژئاوایی ئەم زەمینە نیە مەگەر ئەوەی کەدەمەوێت مافەکەی خۆی ( بێ داوا کردن لەمن) بدەم. کاتێك رۆشتە سەر تەخت، بەژن و کەنیزەکانی خۆی وت بەهۆی ئەو کارەی کەوتۆتە سەرشانی چیتر ناتوانێت کاتێکی زۆر لەگەڵ ئەوان بەسەر ببات، ئەوان دەتوانن بمێننەوە یا لێی جیا ببنەوە. ئەوان گریان و مانەوەیان هەڵبژارد.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بوبە فەرمانڕەوا، رۆشتە سەرتەختی وتاردان و سوپاسی خواوەندی بەخشندەی کرد. یەکەم وتاربو پێشکەشی دەکرد. وتی: ئەی خەڵکینە، هەرکەس دەیەوێت لەگەڵ ئێمەدا بێت، پێنج کار ئەنجام بدات وەگەرنە لەئێمە نزیك نابێتەوە: نیازی کەسێك بەئێمە بگەیەنێت کەدەستی بەئێمە ناگات، بەهەوڵ و تێکۆشانی خۆی بەباشترین شێوە هاوکاری ئێمە بکات، بۆ چاکیەکان رێنوێنیمان بکات، لای ئێمە خراپەی کەس نەهێنێتە سەرزمان، ئەو قسەی هیچ کەڵکێکی نیە، باسی نەکات. شاعیران و وتارخوێنەکان لەدەوری ئەو بلآوەیان لێکرد و فەقیە و خۆپارێزەکان مانەوە و وتیان: ناتوانین لەم پیاوە دور بکەوینەوە مەگەر ئەوەی کرداری

لەگەڵ وتاری ناسازگار بێت.

کاتێك بو بەخەلیفە، قورەیشیەکانی بانگ کردو گەورەکانی خەڵکی کۆکردەوە و پێی وتن: فەدەك لەدەستی پێغەمبەردا(د.خ)بو و ئەو داراییەکەی بۆ شوێنێك خەرج دەکرد کەخوا نیشانی دەدا. ئەبوبەکر و عومەریش بەهەمان شێوە هێشتیانەوە. بەڵام مەروان هەموی بەکەسەکانی خۆی بەخشی و ئێستا گەشتۆتە دەستی من بەڵام وەك سامانی من لەقەڵەم نادرێت تا سامانەکەی بۆ کارەکانی خۆم خەرج بکەم. ئێوە بەشایەت دەگرم کە بۆ شێوەی سەردەمی پێغەمبەر دەیگێرمەوە. پشتی خەڵك لەوتارەکەی لەرزی و تەماحکاران لەستەمی ئەو ( و بەرژەوەندی خۆیان) بێ هیوا بون.

دەڵێن: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بەکۆیلەکەی خۆی موزاحیمی وت: کەسەکانم سامانەکانیان بەمن بەخشی کە نەشیاوە بۆ ئەوان کە ببەخشن و نە شیاوە بۆ من کە وەریبگرم. ئێستا بڕیارمداوە دیاری و سامانەکان بۆ خاوەنەکانیان بگێڕمەوە. کۆیلەکەی وتی: چی لەمناڵەکانت بکەین؟ فرمێسك لەچاوەکانی هاتەخوار و وتی: ئەوان بەخوا دەسپێرم. موزاحیم هاتەدەر و ڕۆشتە لای عەبدولمەلیك کوڕی عومەر و پێی وت: سەروەری باوەڕداران مەبەستی ئەنجامدانی ئەو کارەی کردوە و ئەمە کارێکە زیان لەئێوە دەدات و لەبەر ئەمە رێگەی ئەو کارەم لێگرت. عەبدولمەلیك پێی وت: وەزیرێکی خراپیت! دواتر هەستا و ڕۆشتە لای باوکی و وتی: موزاحیم بەو شێوەیە ئاگاداری کردمەوە، بۆچونی تۆ چیە؟ وتی: دەمەوێت ئەمشەو ئەنجامی بدەم. وتی: پەلە بکە ئەگەری هەیە پێشهاتێك بۆ تۆ روبدات یا شتێکی دیکە لەدڵتا دروست ببێت. عومەر دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: سوپاس بۆ تۆ خوایە کە مناڵێکت پێ بەخشیم کە لەکاروباری دینی هاوکاریم دەکەن. هەمان کات هەستا و سامانەکانی بۆ خاوەنەکایان گەڕاندەوە.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بو بەخەلیفە، ئەوەی لەدەستی کەسان و خزمەکانیدا بو، وەریگرتوە و بە (ستەمکاری) ناوی برد. بەنی ئومەییە ڕۆشتنە لای پورەکەی فاتیمە کچی مەروان و سکاڵایان کرد. ژن هاتە لای عومەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، قسە بکە. عومەر وتی: خوا محەممەدی وەك هۆکارێکی میهرەبانی بۆ هەموان رەوانە کرد نە بەڵگەیەك بۆ ئەشکەنجە کردن. دواتر ئەوی بردەوە و

روبارێکی بۆ خەڵك بەجێهێشت کە وەك یەك لێی بخۆنەوە. دواتر ئەبوبەکر هاتەسەر کار و پارێزگاری لەو روبارە کرد، عومەر بو بەخەلیفە و کارەکانی ئەم دوانەی درێژە پێدا. دواتر یەزید و مەروان و کوڕی عەبدولمەلیك و دو کوڕەکەی وەلید و سلێمان یەك لەدوای یەك هاتن و روبارەکەیان هەڵلوشی تا ئەوەی کاروبارەکان کەوتە ئەستۆی من و ئەو روبارە گەورەیە وشکی کرد و خاوەنەکانی تێراو نابن مەگەر ئەوەی بۆ شێوەی یەکەمی بگەڕێتەوە. ژن وتی: بەسە، دەمویست گوێم لەم وتارە بێت، ئەگەر ئەمە مەبەستی تۆیە، هەرگیز قسەکانت لەبیر ناکەم. ژن بۆ لای ئەوان گەڕایەوە و لەوتەکانی عومەر ئاگاداری کردنەوە. دەستەیەك دەڵێن: ئەو ژنە وتی: بەنی ئومەییە ئەمە و ئەوە دەڵێن. کاتێك عومەر ئەو قسانەی هێنایە سەرزمان، ژن وتی: ئەوان لەزیانەکەی خۆیان ئاگادارت دەکەنەوە. عومەر توڕە بو و وتی: ئەگەر لە هەر زیانێك جگە لەرۆژی هەستانەوە بترسم، هیوادرام کە لێی ئاسودە نەبم. ژن بۆ لای ئەوان گەڕایەوە و ئاگاداری کردنەوە و وتی: ئێوە ئەم کارەتان بەخۆتان کرد، لەگەڵ منالەکانی عومەر کوڕی خەتاب پەیوەندی هاوسەریگریتان بەست و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هات کە هاوشێوەی باوەگەورێی خۆیەتی. ئەوان بێدەنگ بون.

دەڵێت: سوفیانی سەوری وتی: خەلیفەکان پێنج کەسن: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان عەلی، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز. کەسانیتر بەزۆر لەسەر تەختی خەلافەت دانیشتون.

دەڵێت: شافیعیش ئەم بۆچونەی هەیە. وتی: نامەی بۆ کارگوزارەکانی دەنوسی کەسێ کار ئەنجام بدەن: ئەم پێشنیارانە لەناو ئەواندا دەسوڕا: زیندو کردنەوەی شێوازی پێغەمبەر(د.خ) و مراندی کارە تازە و ناڕەواکان، دابەش کردنی سامانەکان لەرۆژی تەنگانەوە و خۆ دورخستنەوە لەستەمکاری.

دەڵێت: فاتیمە کچی حسین کوڕی عەلی وەسفی دەکرد و دەیوت: ئەگەر عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەمایەوە، نیازمەندی کەس نەدەبوین.

فاتیمە هاوسەری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز وتی: جارێك رۆشتمەی لای و بینیم لەنوێژگەکەی خۆی دانیشتوە و بارانی فرمێسك دەرژێنێت بەشێوەیەك کە ریشی بەتەواوی تەڕ بوە. وتم: هیچ رویداوە؟ وتی: بومە سەرپەرەستی کاروبارەکانی ئۆمەتی محەممەد و کەوتمە بیری هەژاری برسی، نەخۆشی هیلاك، شەڕکەران، ستەملێکراوان،

سه‌رکوتکراوان، بێ ناشناکان، زیندانیه‌کان، پیره به‌ته‌مه‌نه‌کان، ئه‌وانه‌ی نانخۆری زۆریان هه‌یه و سامانی که‌م و که‌سانیتر. زانیم که خواوه‌ند له‌رۆژی هه‌ستانه‌وه سه‌بارمت به‌وان پرسیار له‌من ده‌کات و ئه‌و که‌سه‌ی داوای من ده‌کات محه‌ممه‌ده که‌بۆ دادگایی خوا په‌لکێشم ده‌کات. ترسام که نه‌توانم له‌م دادگایه به‌رگری له‌خۆم بکه‌م. به‌زه‌ییم به‌خۆمدا هاته‌وه و ده‌ستم به‌گریان کرد.

ده‌ڵێن: کاتێك نه‌خۆشی مه‌رگ به‌سه‌ر کوڕه‌که‌ی یانی عه‌بدوله‌لیك زاڵبو( و ئه‌و به‌هێزترینی هاوه‌ڵانی له‌کاروباری دادپه‌روه‌ری بو)، عومه‌ر رۆشته لای و پێی وت: کوڕم، حاڵت چۆنه؟ وتی: له‌سه‌ر رێگه‌ی راستی و دروستیم. عومه‌ر وتی: کوڕم، ئه‌گه‌ر تۆ له‌شایه‌نه‌که‌ی مندا بیت باشتره له‌وه‌ی من له‌شایه‌نه‌که‌ی تۆدا بم. کوڕ وتی: باوکه ئه‌گه‌ر مه‌به‌سته‌که‌ی تۆ بێته‌دی، بۆ من باشتره تا ئه‌وه‌ی مه‌به‌سته‌که‌ی من بێته‌دی. ئه‌و له‌کاتی نه‌خۆشی له‌ته‌مه‌نی حه‌فده ساڵی کۆچی کرد.

ده‌ڵێن: عه‌بدوله‌لیك به‌عومه‌ری باوکی وت: ئه‌ی سه‌روه‌ری باوه‌ڕداران، چی به‌خواوه‌ند ده‌ڵێیت ئه‌گه‌ر به‌شێوه‌یه‌ك بڕۆیته لای که مافه‌کانت زیندو نه‌کردبێته‌وه و ناڕاستیه‌کانت له‌ناو نه‌بردبێت؟ وتی: کوڕم، باوك و باوه‌گه‌وره‌کانی تۆ خه‌ڵکیان له‌رێگه‌ی راستی و دروستی بۆ لارێ و رێگه‌ی چه‌وتی برد و کاروباره‌کان کاتێك که‌وته ده‌ستی من که خراپه به‌ته‌واوی بڵاوببویه‌وه و راستی نه‌ما بو. به‌ڵام ئایا جوان نیه که هیچ رۆژێك هه‌تاو هه‌ڵنایه‌ت مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی مافێکم زیندو کردبێته‌وه و ناراستیه‌کم له‌ناو بردبێت؟ مه‌گه‌ر باشتر نیه مه‌رگی من له‌م کاته‌دا بێت؟ هه‌روه‌ها پێی وت: ئه‌ی سه‌روه‌ری باوه‌ڕداران، کاروباره‌کانی خوا راپه‌ڕێنه هه‌رچه‌نده له‌زیانی من و تۆ بێت. عومه‌ر وتی: کوڕم ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی مه‌به‌ستی تۆیه، له‌ناکاو ده‌ستی پێبکه‌م، ناچار ده‌بم شمشێر به‌کار بێنم، ئه‌و کاره‌ی ته‌نیا به‌زۆری شمشێر سه‌قامگیر ده‌بێت، هیچ سودێکی نیه. دوباره هه‌مان وته‌ی هێنایه‌وه سه‌رزمان.

ده‌ڵێن: عومه‌ر کوڕی عه‌بدولعه‌زیز بۆ کارگوزاره‌کانی نامه‌یه‌کی هاوشێوه‌ی نوسی: دوای سڵاو، خوای گه‌وره و رێزدار، خاوه‌نانی ئیسلامی به‌رێز کردوه، گه‌وره‌یی و رێزداری پێ به‌خشیون و ریسوایی و ناته‌وانی کردۆته به‌شی که‌سانێك که ناسازگاری له‌گه‌ڵ ئه‌مان ده‌که‌ن. خاوه‌نانی ئیسلامی کردۆته باشترینی ئۆمه‌ته‌کان که‌واته ئاگادار بن کاروباری

موسوڵمانان بەیەکێك لەخەڵکە ئەمان بەخشراوەکان یا کۆکەرەوانی باج نەسپێرن کە دەست و زمانی ئەوان بۆ سەر موسوڵمانان بکەنەوە و ریسوایان بکەن کە خوا رێزی لێگرتون و ناتەوانیان بکەن کە خواوەند بەتوانایی پێبەخشیون و ئەوان بکەنە ئامانجی فێڵ و زیانی ئەوان و لەگەڵ ئەمەیشدا لەفرت و فێڵی ئەوان ئاسودە نەبن چونکە خواوەند دەفەرمێت: لەبێگانەکان کەس وەك پشتیوانی خۆتان هەڵمەبژێرن چونکە لە ناتەوان کردنی ئێوە کەمتەرخەمی ناکەن و حەز بەرەنج و ئازاری ئێوە دەکەن (ال عمران/٣/١١٨) هاورێیەتی و دۆستایەتی جولەکە و مەسیحیەکان مەکەن چونکە ئەوان هاورێ و دۆستی یەکترن (مائدە/٥/٥١).

ئەوەندە لەئاگادار کردنەوە و دادپەروەری بۆ ئێوە بەسە.

## بیرکردنەوەی روداوێك

بەوتەی دەستەیەك، لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان و ئەبو صاڵحی زەکوان مردن.

## خەلافەتی یەزید کوڕی عەبدولمەلیک

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی عەبدولمەلیک کوڕی مەروان لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت. نازناوەکەی ئەبو خالید بو. براکەی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیک فەرمانیدابو دوای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ببێتە خەلیفەی موسوڵمانان. کاتێك سەردەمی مردنی عومەر نزیك کەوتەوە، پێیان وت: نامە بۆ یەزید بنوسە و پێشنیاری پێبکە بەچاکە لەگەڵ خەڵك هەڵس وکەوت بکات. وتی: پێشنیاری چ کارێکی پێ بکەم؟ لەکوڕەکانی عەبدولمەلیك کوڕی مەروانە! دواتر قەڵەمی هەڵگرت و نوسی: دوای سڵاو، ئەی یەزید بترسە، کە نائاگایی کەوتن و روخانی بەدواوە دێت بەهەمان شێوە کە لەهەڵەکانی تۆ خۆش نابن و رێگەی گەڕانەوەت بۆ ئاوەلا ناکەن. ئەوەی دوای مەرگ بەجێی دێڵیت، بۆ کەسێکی بەجێ دێڵیت کەسوپاسی تۆ ناکات و دواتر دەڕۆیتە لای کەسێك کە بەبەڵگە و پاساوەکانی تۆ رازی نابێت. ماڵئاوا.

کاتێك یەزید هاتە سەرکار، ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك کوڕی قەیسی فیهری وەك فەرماندار دەستنیشان کرد و عەبدولرەحمان، سەلە کوڕی عەبداللە کوڕی عەبدئەلئەسەدی کردە سەرپەرەستی دامەزراوەی داد و ویستی لەگەڵ ئەبوبەکر کوڕی محەممەد ناسازگاری بکات بەڵام هیچ بیانو و بەڵگەیەکی دژی ئەو دەست نەکەوت تا ئەوەی عوسمان کوڕی حەیان لەدەستی ئەبوبەکر لای یەزید کوڕی عەبدولمەلیك گلەیی کرد کە دوجار بەقامچی لێیداوە، داوای لەخەلیفە کرد تۆڵەی بستێنێتەوە. یەزید بۆ عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك نامەی نوسی و وتی: دوای سڵاو، لێکۆڵینەوە بکە و بزانە بەچ هۆکارێك ئەبوبەکر لە کوڕی حەیانی داوە، ئەگەر بۆ کارێکی ئاشکرا یا کارێکی نادیار لێیداوە، هیچی لێ مەپرسە.

کوڕی زوحاك کەسی بەدوای ئەبوبەکر رەوانە کرد و دوجار قامچی لێدا و هیچی لێ نەپرسی.

یەزید لێکۆڵینەوەی لەهەمو کارەکانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کرد و ئەوەی

لەگەڵ خۆی بەناسازگاری بینی، ئاڵوگۆڕی تیا کرد و لەهیچ خراپەیەکی ئەم جیهان و ئەو جیهانە نەترسا و دوری نەکرد. یەکێك لەو کارانە ئەوە بو کە محەممەد کوڕی یوسف برای حەجاج کوڕی یوسف فەرمانڕەوایەتی یەمەنی دەکرد. ئەو باجێکی تازەی لەسەر خەڵکی ئەو وڵاتەدانا. کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتەسەرکار، نامەی بۆ کارگوزارەکەی خۆی نوی کە بە لەسەدا پانزە بەسەندە بکات و ئەو باجەی محەممەد کوڕی یوسف دیاری کردوە، پشت گوێ بخات. وتی: مشتێك گەنمە شامی لای من خۆشەویستتر لەو باجەیە. کاتێك یەزید هاتە سەرکار، فەرمانی وەرگرتنی ئەو باجەی دەرکردەوە و بۆ کارگوزارەکەی نوسی: ئەو باجەیان لێ وەربگرە تەنانەت ئەگەر هەمویان لەناوچون.

## کوژرانی شوەزبی خارجی

پێشتر ئاماژەمان پێدا کە ئەو لەبەرابەر ستەمی ئومەوییەکان شۆرشی دەست پێکرد و کەسی بۆ لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ڕەوانە و گفتوگۆی لەگەڵ کرد. کاتێك عومەر مرد، عەبدولحەمید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی زەید کوڕی خەتاب (فەرمانداری کوفە) مەبەستی ئەوەی کرد گوێڕایەڵی خۆی بەیەزید کوڕی عەبدولمەلیك نیشان بدات و پێگەی لای ئەو بەرز ببێتەوە. لەبەر ئەمە نامەی بۆ محەممەد کوڕی جەریر نوسی و فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ شوەزب (ناوی بێستام بو) دەست پێبکات. هێشتا دو نێردراوەکەی شوەزب نەگەڕابونەوە و لەمەرگی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ئاگادار نەبو.

کاتێك بینیان محەممەد بۆ شەڕی خۆی ئامادە دەکات، شوەزب کەسی ڕەوانە کرد و وتی: بۆ پێش کاتی دیاریکراو خۆتان ئامادە دەکەن؟ مەگەر بەڵێنمان بەیەك نەدابو چاوەڕێ بین تا نێردراوەکان دەگەڕێنەوە؟ محەممەد وەڵامی دایەوە: ناتوانین بەم شێوەیە دەستبەرداری ئێوە بین. خەواریج وتیان: ئەوان ئەو کارەیان دەست پێناکەن مەگەر ئەوەی ئەو پیاوە چاکەکارە مردبێت.

هەردولا شەڕیان کرد و چەند کەسێك لەخەواریج بریندار بون و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی کوفە کوژران و ئەوانی دیکە هەڵاتن. محەممەد کوڕی جەریر پشتی بریندار و بۆ ناو کوفە هەڵات. خەواریج شوێنیان کەوتن تا گەشتنە کوفە و دواتر بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە.

شوەزب چاوەڕوانی هاتنەوەی نێردراوەکانی خۆی دەکرد. ئەو دوانە گەڕانەوە و لەمەرگی عومەر ئاگاداریان کردەوە. یەزید ئەو کەسانەی لای تەمیم کوڕی حوباب بون، هاورێ لەگەڵ دوهەزار پیاوی شەڕکەر بۆ شەڕی خەواریج رەوانەی کردن. ئەو، ئاگاداری کردنەوە کە یەزید بەشێوەی رۆژگاری خەلافەتی عومەر، دەستبەرداریان نابێت. ئەوان نفرینیان کرد و هاورێ لەگەڵ ئەو یەزید کوڕی عەبدولەلیکیان نفرین کرد و شەڕیان دەسپێکرد و ئەویان کوشت و سوپاکەیان کوشتار کرد کەدەستەیەکیان بۆ ناو کوفە هەلاّتن و دەستەیەکیان بۆ لای یەزید. ئەم جارە یەزید، نەجدە کوڕی حەکەمی ئەزدی لەگەڵ دەستەیەك شەڕکەر بۆ شەڕی خەواریج رەوانە کرد کە ئەویش کوژرا و هاورێکانی شکستیان خوارد. یەزید، سەحاج کوڕی وەداعی لەگەڵ دو هەزار شەڕکەر بۆ شەڕی ئەوان رەوانە کرد کەئەویشیان کوشت و سوپاکەیان تێکشکاند. چەند کەسێك لەخەواریج و لەناو ئەوان هودبە کوڕی مامی شوەزب کوژران. ئەیوب کوڕی خەولی لەپرسەی ئەواندا وتی:

| | |
|---|---|
| ترکنا تمیما فی الغبار ملحبا | تبکی علیه عرسه و اقاربه |
| و قد اسلمت قیس تمیما و مالکا | کما اسلم الشحاج امس اقاربه |
| و اقبل من حران یحمل رایة | یغالب امر الله و الله غالبه |
| فیا هدب للهیجا یا هدب للندی | و یا هدب للخصم الا لد یحاربه |
| ویا هدب کم من ملجم قد اجبته | و قد اسلمته للریاح جوالبه |
| و کان ابو شیبان خیر مقاتل | یرجی و یخشي حربه من یحاربه |
| ففاز و لا قی الله فی الخیرکله | و خدمه بالسیف فی الله ضاربه |
| تزود من نیاه درعا و مغفرا | و عضبا حساما لم تخنه مضاربه |
| و اجرد محبوك السراة کانه | اذا انقض و افی الریش حجن مخالبه |

یانی: تەمیم مان لەناو بای گۆڕەپان بەجەستەیەکی لەت و پەت بەجێهێشت بەشێوەیەك کە ئێستا ژنە گەنجەکەی و کەسەکانی بۆی دەگریین. قەیس، مالك و تەمیمی بەدەستی مەرگ سپارد کە دوێنێ شەحاج بەدەستی نزیکەکانی بەمەرگ سپێردرا. لەحەرانەوە هات و ئالاّی هەلّکرد تا بەسەر فەرمانی خوادا زالّبێت بەلاّم سەرکەوتن بەردەوام تایبەتە بەخواوەند. ئەی هودبە شەڕ، ئەی هودبە بەخشین، ئەی

هودبە، ئەی کە لەگەڵ دوژمنێکی سەرسەخت پیاوانە شەڕ و سەرکوتت کرد. ئەی هودبە، چەند زۆرن ئەو پاڵەوانانەی داوای روبەرووبونەوەیان لێکردیت و وەڵامت دانەوە و ئەوانت کوشت و هاورێکانیان ئەوانیان تەسلیمی هەڵکردنی باکان کرد. ئەبو شەیبان باشترین شەڕکەر بو، هەموان هیوایان بەو بو و دوژمنان لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەو دەترسان. ئەو رزگاری بو و لەگەڵ هەمو چاکیەکان بۆ لای خواوەند کۆچی کرد و بکوژەکەی (کە لەرێگەی خوادا هەوڵی دەدا) بەشمشێر لەت و پەت کرد. لەم جیهانە زرێ و خودەیەکی هەڵگرت تا شەڕکەری ئامادەی شەڕ لەرێگەی خوادا بێت، شمشێرێکی هەڵگرت کە لەهاورێیەتی بازوە بەتواناکانی خۆی دورینەخستەوە. پێشەنگ ئاسا هێرشی برد، سەیری پشت و دواوەی خۆی نەکرد تا پشتیان بەشمشێر کردە دوکەرت و کاتێك کەوتە سەرزەوی، دەتوت لاشخۆرێکە کە باڵەکانی دەکردەوە و بەچنگە گەورەکانی خۆی بۆ راوی نێچیر دەپەرێت.

خەواریج لەشوێنی خۆیان مانەوە تا مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك گەڕایەوە بۆ کوفە و کوفیەکان لەبونی خەواریج لای ئەو سکاڵایان کرد و ئەویان لەشوەزب ترساند. مەسلەمە، سەعید کوڕی عەمرۆی حەرەشی کەسوارەیەکی بەئەزمون بو، لەگەڵ دەهەزار پیاوی شەڕکەر بۆ روبەروبونەوە لەگەڵ شوەزب رەوانە کرد. شوەزب لەشوێنەکەی خۆیدا بو کەئەوان گەیشتن. شوەزب و هاورێکانی سوپایەکی ئەوەندە گەورەیان بینی کە دەیاندەزانی ناتوانن خۆڕاگری بکەن. شوەزب بەهاوەڵانی خۆی وت: هەر کەس خوازیاری گیان بەخشینە، ئێستا روبەروی بۆتەوە و هەرکەسێك خوازیاری جیهانە بزانێت کە لەدەستی چوە. ئەوان کاڵانی شمشێرەکانی خۆیانیان شکاند و هێرشیان برد و ریزەکانی سوپاکەی سەعیدیان بڕی بەشێوەیەك کەسەعید لەریسوایی ترسا و سەرکۆنەی سوپاکەی خۆی کرد و وتی: ئەی بێ باوکینە، لەم دەستە کەمە هەڵدێن! ئەی خەڵکانی شام، شەرێکە هاوشێوەی شەڕەکانی پێشوی ئێوە! ئەوان هێرشیان کرد و شوەزب و سوپاکەیان کوشتار کرد.

## مەرگی محەممەد کوڕی مەروان

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان کوڕی حەکەم برای عەبدولەلیك مرد. ئەو فەرمانداری ئەرمەنستان و ئازەربایەجان و جەزیرە بو و چەندین جار شەڕی لەگەڵ رۆمیەکان و خەڵکی ئەرمەنستان کردبو. پیاوێکی بوێر و ئازا بو و عەبدولەلیك لەبەر ئەمە رژدی پێ دەبرد. کاتێك کاروبارەکان بۆ عەبدولەلیك سامانداران، ئەوەی لەدڵیدابو، ئاشکرای کرد. محەممەد خۆی ئامادە کرد تا بەرەو ئەرمەنستان بەرێکەوێت. کاتێك ماڵئاوایی لە عەبدولەلیك کرد، لەهۆکاری رۆشتنەکەی پرسی کە محەممەد وتی:

وانك لا ترى طردا لحر          كالصاق به بعض الهوان

فلو كنا بمنزلة جميعا          جريت و انت مضطرب العنان

یانی: هیچ دورکەوتنەوەیەك بۆ پیاوی ئازا، بەئازارتر لەوە نیە کە بەریسوای بزانن. ئەگەر هەموومان لەیەك پێگەدا دەبوین، من ئەسپم غاردەدا و تۆ جڵەوێکی پەرێشان دەبویت.

عەبدولەلیك وتی: سوێندت دەدەم تا بمێنیتەوە چونکە لەمنەوە هیچ رەنجێك بەتۆ ناگات. رێگەی میهرەبانی لەگەڵ ئەو گرتەبەر. کاتێك وەلید مەبەستی ئەوەی کرد لەسەر کار لایببات، هیچ کەس جگە لەمەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك بەم کارە رازی نەبو.

## هاتنی یەزید کوڕی موهەلیب بۆ بەسرە و ڕا پەڕاندنی خەڵك دژی یەزید کوڕی عەبدولەلیك

بەهەمان شێوە کەپێشتر ئاماژەی پێدرا، لەم ساڵەدا یەزید کوڕی موهەلیب لەزیندانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هەلات. کاتێك عومەر مرد و خەڵك لەگەڵ یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بەیعەتیان کرد، یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بۆ عەبدولحەمید کوڕی عەبدولرەحمان و عودەی کوڕی ئەرتات نامەی نوسی و ئەم دوانەی ئاگادار کردەوە کە یەزید کوڕی موهەلیب هەلاتوە و دەبێت لەبەرابەر ئەو وکارەکانی وشیار و چاوکراوە بن. فەرمانی بەعودەیدا هەمو کەسەکانی بنەماڵەی موهەلیب لەبەسرە بگرێت و بیانخاتە زیندان، کەسانی وەك: موفەزەل کوڕی موهەلیب، حەبیب کوڕی موهەلیب و مەروان کوڕی موهەلیب. ئەوانی گرت و زیندانی کردن. یەزید کوڕی موهەلیب هات تا گەیشتە قوتقوتانە. عەبدولحەمید سوپایەکی بۆ ڕوبەروبونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد کە فەرماندەکەی هوشام کوڕی موساحیێقی عامری بو. ئەم سوپایە بەڕێکەوت و لەعوزەیب دابەزی. یەزید کوڕی موهەلیب لەنزیکی ئەوانەوە تێپەڕی بەلام هێرشیان نەکردە سەر. یەزید کوڕی موهەلیب بەرەو بەسرە بەڕێکەوت و بینی کە عودەی کوڕی ئەرتات خەڵکانی بەسرەی کۆکردۆتەوە و لەدەوری شار سەنگەری هەڵکەندوە و فەرماندەیی سوارەکانی بەموغەیرە کوڕی عەبداللە کوڕی ئەبی عەقیلی سەقەفی سپاردوە. یەزید هاوڕێ لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بون، گەیشت و براکەی محەممەد کوڕی موهەلیب لەگەڵ کەسانێك لەخەڵك و دۆستان و شوێنکەوتەکانیان پێشوازیان لێکرد. عودەی کوڕی ئەرتات بۆ هەرگەرەکێك لەگەڕەکەکانی بەسرە پیاوێکی دیاری کرد: بۆ ئەزدیەکان موغەیرە کوڕی زیاد کوڕی عەمرۆ عەتەکی، بۆتەمیمیەکان موحریز کوڕی حومرانی سەعدی، بۆ گەڕەکی بەکریەکان موفەرەج کوڕی شەیبان کوڕی مالك کوڕی مێسمەع، بۆ خەڵکی عەبدقەیس مالك کوڕی مونزەر کوڕی جارود و بۆ خەڵکی عالیە عەبدولعەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عامر. خەڵکی عالیە ئەم کەسانە بون: قورەیش، کەنانە، ئەزد، بەجەیلە، خەسعەم، هەمو قەیسی عیلان و موزەینە. بەکوفیەکان و خەڵکی عالیە

(روبعی خەڵكانی مەدینە) دەوترا).

یەزید كوڕی موهەلیب هات. لای هەر دەستەیەك لەسوارکارەکان و لای هەر هۆزێك لەهۆزەكانی ئەوان تێدەپەڕی، ڕێگەكەیان بۆ چۆڵ دەكرد. یەزید گەیشت و لەماڵەكەی خۆی دابەزی. خەڵك هاتوچۆیان دەكرد. كەسی بۆ لای عودەی كوڕی ئەرتات رەوانە كرد و پەیامیدا كە: براكانم بۆ لای من رەوانە بكە و من لەسەر بەسرە لەگەڵ تۆ ئاشتی دەكەم و بەتۆی دەسپێرم تا ئەوەی دەمەوێت لەیەزید كوڕی عەبدولمەلیكی وەربگرم. رازی نەبو. حەمید كوڕی عەبدولمەلیك كوڕی موهەلیب بۆ لای یەزید كوڕی عەبدولمەلیك بەرێكەوت و یەزید كوڕی عەبدولمەلیك هاورێ لەگەڵ ئەو خالیدی قەسیری و عەمرۆ كوڕی زەیدی حەكەمی بەئەمان نامەیەك بۆ یەزید كوڕی موهەلیب و كەسەكانی رەوانەی لای فەرمانداری بەسرە كرد.

یەزید كوڕی موهەلیب دەستی بەبلاّو كردنەوەی سامانەكان كرد و زێر و زیوی بەخەڵكان دەبەخشی و خەڵكان لەدەوری كۆبونەوە. عودەی كوڕی ئەرتات تەنیا یەك درەم یا دو درەمی دەبەخشی و دەیوت: بۆ من رەوا نیە جگە لەدرەمێك لەگەنجینە( ئەویش بەفەرمانی یەزید كوڕی عەبدولمەلیك)بەئێوە ببەخشم. بەم ئەندازەیە بەسەندە بكەن تا لەمبارەوە فەرمان بگات. فەرەزدق لەمبارەوە وتی:

افن رجال الدرهمين تقودهم　　　الی الموت آجال لهم و مصارع

و اكيسهم من قر فی قعر بيته　　　و ايقن ان الموت لابد واقع

یانی: گومانم ئەوەیە ئەو كەسانەی دو درەمیان وەرگرت كۆتاییەكانی ژیانی ئەوان و كوشتنەگەكەیان بەرەو مەرگیان دەبات. زرنگترینی ئەوان كەسێكە بخزێتە قوڵایی ماڵەكەی خۆی و بێ گومان دەزانێت مەرگ خوازراو و نەخوازراو دەگات.

بەنی عەمرۆ كوڕی تەمیم لەریزی هاوەڵانی عودەیدا نەمان و لەمێربەد دابەزین. یەزید كوڕی موهەلیب یەكێك لەكۆیلەكانی خۆی بەناوی دارسی بۆ لای ئەوان رەوانە كرد كەهێرشی كردە سەریان و شكستیدان. كاتێك خەڵك لەدەوری یەزید كوڕی موهەلیب كۆبونەوە، هاتەدەر و لەجەبانەی بەنی یەشكر دابەزی كە نیوەی رێگە تا كۆشك بو. قەیسیەكان و شامیەكان و تەمیمیەكان روبەروی بونەوە و بۆ ماوەیەك شەڕیان كرد. سوپاكەی یەزید هێرشیان كردە سەریان كەشكستیان خوارد و كوڕانی موهەلیب شوێنیان

کەوتن تا لەکۆشکەکە نزیك کەوتنەوە. عودەی خۆی روبەرویان بویەوە و لەیارانی ئەو موسا کوڕی وەجیهی حێمەیری و حارس کوڕی موصریفی ئەودی (لەسوارکارەکانی حەجاج و گەورەکانی شام) کوژران و سوپاکەی عودەی شکستی خوارد. براکانی یەزید کە لەزینداندا بون، دەنگەکانیان بیست کە بەزیندان دەگات و زوبینەکانیان بینی بەسەر دەرگا و دیواری زیندانەکە دەبارێت. عەبدولەلیك کوڕی موهەلیب بەوانی وت: گومانم دەکەم کە براکەمان یەزید سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و من لەموزەریەکان و ئەو خەڵکانەی شام کە لەگەڵ عودەی هاودەستەن، ئاسودە نیم و دڵنیام پێش ئەوەی یەزید بگات، دێن و ئێمە لەناو دەبەن. دەرگاکان ببەستن. ئەو کارەیان کرد. ئەوەندەی نەخایاند کە عەبداللە کوڕی دینار موالی بەنی عامر (فەرماندەی پاسەوانەکانی عودەی) بەرەو دەرگاکان ڕۆیشت و لەگەڵ هاوەڵانی مەبەستی کردنەوەی دەرگاکانی کرد بەڵام هیچ کارێکی بۆ نەکرا و خەڵك گەیشتن و پاشەکشێیان بەوان کرد.

یەزید کوڕی موهەلیب هات و لەماڵی سلێمان کوڕی زیاد کوڕی ئوبیە لەتەنیشت کۆشك نیشتەجێ بو. پەیژەکانیان هێنا و دەستیان بەسەر کۆشکدا گرت. عودەی کوڕی ئەرتاتیان بردە لای یەزید کە خستیە زیندان و وتی: ئەگەر براکانی منت زیندانی نەدەکرد، تۆم زیندانی نەدەکرد.

کاتێك یەزید سەرکەوت، گەورەکانی بەسرە لەتەمیم و قەیس و مالك کوڕی مونزەر بۆ کوفە هەڵاتن و دەستەیەك لەخەڵکانی شام پەیوەستی ئەوان بون. موغەیرە کوڕی زیاد کوڕی عەمرۆ عەتەکی بەرەو شام بەرێکەوت و خالیدی قەسری و عەمرۆ کوڕی ئەبی یەزیدی حەکەمی بینی کە حەمید کوڕی عەبدولەلیك کوڕی موهەلیب لەگەڵ ئەو دوانە بو و ئەمان نامەیان بۆ یەزید کوڕی موهەلیب هێنابو لەگەڵ هەمو ئەو شتانەی کەداوای دەکرد. ئەو دوانە پرسیاری بارودۆخ و هەواڵەکانیان لێپرسی و ئەو دور لەچاوی حەمید لەگەڵ ئەم دوانە کۆبویەوە و ئاگاداری کردنەوە و وتی: دەتانەوێت بۆ کوێ بڕۆن؟ پێیان وت کە: ئەمان نامەی خەلیفەیان پێیە. وتی: یەزید دەستی بەسەر بەسرەدا گرتوە، کەسانێکی کوشتوە و عودەی کوڕی ئەرتاتی خستۆتە زیندان، بگەڕێنەوە. گەڕانەوە و حەمیدیان لەگەڵ خۆیان برد. حەمید بەو دوانەی وت: سوێندتان دەدەم ناسازگاری لەفەرمانی خەلیفە مەکەن چونکە کوڕی موهەلیب بەهەمو شتێکی ئێوە رازی

دەبێت. ئەم پیاوە و کەسەکانی بەردەوام لەدوژمنەکانی ئێمە بون، گوێ لەقسەکانی مەگرن. گوێیان لەوتەکانی ئەو نەگرت و گەڕانەوە و حەمیدیان لەگەڵ خۆیان برد.

عەبدولحەمید کوڕی عەبدولرەحمان لەکوفە خالید کوڕی یەزید کوڕی موهەلیب و حەمال کوڕی زەحری گرت (کە لەهیچ کارێکدا بەشدار نەبون) و دەست بەسراو بۆ شام ڕەوانەی کردن. یەزید کوڕی عەبدولەلیك ئەم دوانەی خستە زیندان و لەزیندان مانەوە تا مردن. یەزید کوڕی عەبدولەلیك شتێکی بۆ کوفە ڕەوانە کرد تا بەسەر خەڵکانی ئەو شارە دابەش بکرێت، مژدەی زیاد کردنی بەخششەکانی پێدان. براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك لەگەڵ برازاکەی عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولەلیك هاوڕێ لەگەڵ حەفتا هەزار پیاوی شەڕکەر لەخەڵکانی شام و جەزیرە بەرەو کوفە بەڕێکەوتن. دەستەیەك دەڵێن: هەشتا هەزار کەس بون. ئەوان بەرەو عێراق ڕۆیشتن. مەسلەمە ڕەخنەی لەعەباس دەگرت و سەرکۆنەی دەکرد. لەبەر ئەمە ناسازگاری لەناو ئەواندا دروست بو و عەباس بۆی نوسی:

| | |
|---|---|
| الا نفسی فداك ابا سعید | و تقصر عن ملاحاتی و عذلی |
| فلولا ان اصلك حین ینمی | و فرعك منتهی فرعی و اصلی |
| و انی ان رمیتك هضت عظمی | و نالتنی اذا نالتك نبلی |
| لقد انکر تنی انکار خوف | یقصر منك عن شتمی و اکلی |
| کقول المرء عمرو فی القوافی | ارید حیاته و یرید قتلی |

یانی: ئەی باوکی سەعید، گیانم قوربانی تۆ بێت، لەرەخنە گرتن و سەرکۆنە کردنی من دەست هەڵبگرە. داستان بەم شێوەیە ئەگەر بەدوای رەچەڵەکی تۆدا بگەڕێن و لقەکانی تۆ بدۆزنەوە، دەگاتە ریشەی من و بەلقەکانی من کۆتایی دێت. ئەگەر تیر بۆ تۆ بهاوێژم، ئێسقانی خۆم دەشکێنم و کاتێك زوبینی من لەجەستەی تۆ بچەقێت، سەرەتا جەستەی خۆم دەدرێت. تۆ لەبەر ترس منت لەبەرچاو نەگرت و ئەمە بو بۆ جوێندان و سەرکۆنە کردنی من پاڵی پێوە نایت. ئەمە هاوشێوەی داستانی ئەو پیاوە شاعیرە (عەمرۆیە) کەوتی: من خوازیاری ژیانی ئەوم و ئەو خوازیاری مەرگی من.

دەستەیەك دەڵێن: ئەمە هۆنراوەی عەباس و دەستەیەك دەڵێن: وتاری کەسانی دیکە دەگێڕنەوە و دەڵێنەوە.

هەواڵی ئەم کارە بەیەزید کوڕی عەبدولمەلیك گەیشت کە کەسی ڕەوانە کرد و ئەوانی ئاشت کردەوە. ئەم دوانە گەیشتنە کوفە و لەنوخەیلە دابەزین. مەسلەمە وتی: خۆزگە موهەلیب فورسایی شەڕی لەم گەرما سوتێنەرە نەدەخستە سەرشانی ئێمە. حەیانی نەبتی موالی بەنی شەیبان وتی: من بەڵێن دەدەم کە لەگۆڕەپانی شەڕ بەسلامەتی ڕزگاری دەبێت. عەباس وتی: نەحلەت لەدایکت! تۆ نەبتی باشتر لەعەرەبی دەزانیت! حەیان وتی: خوا ڕووی تۆ ڕەش بکات کە ئێستا سور و سپیە و نیشانەی خەلافەتی پێوە نیە. مەسلەمە وتی: ئەی ئەبو سوفیان، وتەکەی عەباس تۆی نەڕەنجاند. حەیان وتی: ئەو ئەهمەق (گێژ)ە. دەیویست بڵێت: ئەو ئەحمەقە.

کاتێك سوپاکەی یەزید کوڕی موهەلیب هەواڵی هاتنی خەڵکانی شامیان بەسەرکردایەتی مەسلەمە بیست، ترسان. ئەم هەواڵە بەکوڕی موهەلیب گەیشت. لەناو خەڵك وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: سوپاییەکانم بینی کە ترساون و دەڵێن: خەڵکانی شام گەیشتن. مەگەر شامیەکان چین؟ هەمویان نۆ شمشێرن کە حەوتیان لەگەڵ منە و دو شمشێر دژی من. مەسلەمە تەنیا کولەیەکی زەردە کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە بەربەریەکان و جەرمەقیەکان و جەرجەمیەکان و نەبتیەکان و دێهاتیەکان و نەزانەکان و تازە باوەڕداران بۆ ئەم دیارە هاتوە. مەگەر ئایا خەڵکانێکی هاوشێوەی ئێوە نین؟ ئازاریان دەبێت بەهەمان شێوەی ئێوە. ئێوە هیواتان بەخوایە و ئەوان نا. بازوو و مشتەکانتان بەقەرز بدەن بەمن و شەقەزللە لەروخساریان بدەن تا هەڵبێن. خەڵکانی بەسرە بەفەرمانەکانی یەزید ڕازی بون و ئەو کارگوزارەکانی خۆی بۆ ئەهواز و فارس و کرمان ڕەوانە کرد و مودرێکی برای بۆ خوراسان نارد کە عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم فەرمانڕەوایەتی دەکرد. ئەو بەخەڵکی ئەو ناوچەی وت: ئەوە مودرێکە کەهاتوە تا شەڕ و ئاژاوە لەناو ئێوەدا دروست بکات و زیانتان پێ بگەیەنێت. ئێوە لەسەرزەمینێکدا دەژین کە ئارامی باڵی بەسەردا کێشاوە و خۆتان گوێڕایەڵی سەروەری خۆتانن. بەنی تەمیم بەرێکەوتن تا بیپارێزن. ئەم هەواڵە بەنەزدیەکانی خوراسان گەیشت. نزیکەی دو هەزار سوار لەوان هاتنەدەر و مودرێکیان لەبیابان بینی وپێیان وت: تۆ خۆشەویسترینی خەڵکان لای ئێمەیت، براکەت شۆڕشی کردوە، ئەگەر سەرکەوێت، لەبەرژەوەندی ئێمەدایە و ئێمە لەزوترین کات پەیوەستی ئێوە دەبین و بۆ ئەم کارە شیاوترینی

خەڵکانین. بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت، لەوەی ئێمە گیرۆدەی ڕەنج و ئازار دەکەیت، هیچ سودێکت پێ نابڕێت. ئەو لەشارەکەی ئەوان هاتەدەر. کاتێك خەڵکانی بەسرە لەدەوری یەزید کۆبونەوە، قسەی بۆ ئەوان کرد و ئاگاداری کردنەوە کە بانگەشەی گەڕاندنەوە و ژیاندنەوەی شێوازی پێغەمبەر(د.خ) دەکات و ئەوان بۆ شەر لەرێگەی خوا هان دەدات و گومان دەکات کە شەڕ کردن لەگەڵ خەڵکانی شام پاداشتێکی گەورەتری هەیە لەشەڕ کردن لەگەڵ تورکەکان و خەڵکانی دەیلەم.

حەسەنی بەسرە ئەم قسانەی بیست. دەنگی خۆی بەرز کردەوە و وتی: سوێند بەخو تۆمان هەم هاوشێوەی فەرماندار بینیوە هەم فەرمانبەر، شیاو نیە بۆتۆ ئەم قسانە بێنیتە سەرزمان. هاورێکانی هەستان و دەمیان گرت و دایانیشاند. لەمزگەوت هاتنەدەر و بینیان نەزر کوڕی ئەنس کوڕی مالك لەبەردەرگای مزگەوت وەستاوە و دەڵێت: ئەی بەندەکانی خوا، لەوەی وەڵامی بانگەوازی گەڕانەوە بۆ شێوەی پێغەمبەر(د.خ) بدەنەوە، هیچ زیانێك نابینن چونکە سوێند بەخوا لەکاتی لەدایك بونتانەوە، جگە لەچەند رۆژی فەرمانڕەوایی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ، نە بینیوتانە و نەبینیومانە. حەسەنی بەسری وتی: نەزریش شایەتی دەدات. حەسەن لای خەڵك تێپەڕی و بینی ئاڵاکانیان هەڵکردوە و چاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی یەزیدن و دەڵێن: داوای گەڕانەوە بۆ شێوەی دو عومەرمان لێدەکات ( عومەر کوڕی خەتاب و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز). حەسەن دەیوت: یەزید دوێنێکە ملی ئەو کەسانەی سەرڕدەبڕی و سەری ئەوانی بۆ بەنی مەروان ڕەوانە دەکرد و بەم کارەی دەیویست ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بێنێت، کاتێك لەوان ڕەنجا و بێ هیوابو، ڕمێکی بەرز کردەوە و پەڕۆیەکی تێوەپێچاند و وتی: من ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئومەوییەکان دەگرمەبەر، لایەنگیریم لێ بکەن. ئەوان وتیان: دەیکەین. وتی: من ئەوان بۆ گەڕانەوە بۆ شێوەی دو عومەر بانگ دەکەم. شێوەی عومەرەکان فەرمانمان پێدەدات زنجیر لەقاچی بکەین و بیخەینە زیندان. کەسانێك لەهاورێکانی وتیان: دەڵێی لەکردەوەی خەڵکانی شام ڕەزامەندیت؟ وتی: من لەوان ڕەزامەندم؟ خوا قێزەونیان بکات و لەناویان ببات. مەگەر خەڵکانی شام نەبون ڕێزی بارەگایی خوایان پێشێل کرد و سێ ڕۆژی بەردەوام خەڵکەکەیان کوشتار کرد و ژنە داوێن پاکەکانیان کردە کۆیلەی خۆیان و لەبەفیرۆدانی ئایین شەرمیان نەدەکرد، دواتر رویان لەکەعبە کرد

و خاپوریان کرد و بەردەکانیان هەڵکەند و پەردەکانیان سوتاند. نفرینی خوا لەوان بێت و کۆتایی کارەکانیان بەخراپە کۆتایی بێت.

یەزید لەبەسرە بەرێکەوت و براکەی مەروان کوڕی موهەلیبی لەوێ دەستینشان کرد و روی کردە واست. کاتێك بەرەو واست رەوانە بو، لەگەڵ یارانی خۆی راوێژی کرد. حەبیبی برای و کەسانی دیکە پێیان وت: باشترە برۆین و لەپارس دابەزین و دۆڵ و گەردنەکان بگرین. خۆمان لەخوراسان نزیك و شەڕ لەگەڵ خەڵکانی شام درێژ بکەینەوە چونکە خەڵکانی کوێستان پەیوەستی تۆ دەبن و دەبینن کە شوێن و قەڵا بەهێزەکان لەدەستی تۆدایە. یەزید وتی: من ئەمە پەسەند ناکەم، ئێوە دەتانەوێت بمکەنە مەلێك لەسەر بەرزایی کێوەکان. حەبیب وتی: بۆچونی راست کەدەبوا لەسەرەتایی کارەکەمان ئەنجامەمان بدایە، لەدەستمان چو. کاتێك بەسەر بەسرەدا زاڵبویت، پێم وتیت سوارەکان بەسەرکردایەتی کەسێکی بنەماڵەکەت بۆ کوفە رەوانە بکە کە عەبدولحەمید فەرمانڕەوایەتی دەکات. لەگەڵ حەفتا پیاوی شەرکەر لای ئەو تێپەریتیت و ناتەوانت کرد. ئەو لەبەرابەر سوارەکانی تۆ ناتەوانتر دەبو. شامیەکان دەستیان بەسەر ئەو شارەدا گرت لەکاتێکدا زۆربەی خەڵکانی کوفە شوێنکەوتەی تۆ بون. باشتر بو تۆ فەرمانڕەوایەتی کوفیەکان بکەیت نە شامیەکان، بەڵام بەوتەکانم رازی نەبویت. ئێستا بۆچونی خۆمت پێ دەڵێم: سوارکارەکان بەسەرکردایەتی یەکێك لەکەسانی بنەماڵەکەت رەوانە بکە تا بەرەو جەزیرە ئەسپ غاربدەن پێش ئەوەی شامیەکان دەستی بەسەردا بگرن. ئەوان لەیەکێك لەقەڵاکان دابەزن و تۆ بەدوای ئەواندا بەرێکەوە. کاتێك سوپاکەی شام مەبەستی تۆ بکات، سوپاکەی تۆ لەجەزیرە رێگە نادەن هێرش بکەنە سەر تۆ. لەوێ دەمێننەوە و لەهێرش کردنە سەر تۆ رێگریان لێ دەکەن تا دەگەیتە لایان. هاوەڵانی تۆ لەموسڵ، پەیوەستی تۆ دەبن و عێراقیەکان و سنورنشینەکانیش و تۆ لەسەرزەمینێك بەبەهای هەرزان و کاڵای فراوان شەڕی ئەوان دەکەیت و سەراسەری عێراق وەك پشتیوانە لە پشت سەری تۆیە. یەزید وتی: حەز ناکەم سوپاکەم بکەم بەدو بەش. کاتێك گەیشتە واست، چەند رۆژێك مایەوە و ساڵ کۆتایی پێ هات.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك کوڕی قەیس ئاییڤی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. ئەو فەرمانداری مەدینە بو. فەرمانداری مەککە عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید، فەرمانداری کوفە عەبدولحەمید، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە شەعبی، فەرمانداری خوراسان عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم و بەسرە لەدەستی کوڕی موهەلیبدا بو.

لەم ساڵەد ئیسماعیل کوڕی عوبەیداللە لەفەرمانڕەوایەتی ئەفریقیە لابرا و لەجیاتی ئەو یەزید کوڕی ئەبی مولسیم دەبیری حەجاج بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرا. لەوێ بو کە کوژرا کە بەخواستی خوای گەورە ئاماژەی پێدەدەین.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: موجاهید کوڕی جەبر کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٢١/١٠٣ زاییڤی یا ساڵی ١٠٤/ ٧٢٢ زاییڤی مرد و لەم کاتەدا تەمەنی ٨٨ ساڵ بو. عەمار کوڕی جەبر (بەوتەی هەندێ کەس)، ئەبو ساڵح زەکوان، عامر کوڕی ئەکسەمەی لەیسی، ئەبو ساڵح سەمان کە پێیان دەوت زەیات (رۆن فرۆش) چونکە رۆنی دەفرۆشت، ئەبو عەمرۆ سەعید کوڕی ئەیاسی شەیبانی لە تەمەنی ١٢٧ ساڵی کە پێغەمبەری(د.خ) ئەبینی، ئەبو ئەلقاسم عوبەیدە کوڕی ئەبی لەبابەی عامری (لەکاتی خەلافەتی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ).

## ڕوداوەکانی ساڵی سەد و دووی کۆچی ( ٧٢٠ - ٧٢١ زایینی )

## کوژرانی یەزید کوڕی موهەلیب

یەزید کوڕی موهەلیب لە واستەوە بەرێکەوت و کوڕەکەی معاویە کوڕی یەزیدی وەك کارگوزاری خۆی لەم شارە دەستنیشان کرد و ئەسیرەکان و گەنجینەی پێ سپارد. خۆی لەسەر لێواری ڕوباری نیل بەرێکەوت تا لەعەقر دابەزی و براکەی عەبدولەلیك کوڕی موهەلیبی بۆ کوفە ڕەوانە کرد. عەباس کوڕی وەلید لەسورا پێشوازی لێکرد و شەڕ لەنێوانیاندا دروست بو. هاوەڵانی عەبدولەلیك هێرشیان برد و پاشەکشێیان پێکردن. کەسانێك لەتەمیم و قەیس لەخەڵکی بەسرە هاورێیەتیان دەکردن. هاواریان کرد: ئەی خەڵکانی شام، خوا، خوا، ئێمە لەبەرابەر دوژمن بەتەنیا جێ مەهێڵن! سوپاکەی عەبدولەلیك ئەوانیان بۆ کەنارەکانی ڕوبارەکە ڕاونابوو. خەڵکانی شام وتیان: ترستان لەسەر نیە، ئێمە لەسەرەتایی شەڕ بەمشێوەیە هێرش دەبەین. دواتر هێرشیان برد و سوپاکەی عەبدولەلیك بلاوەیان لێکرد و تێکشکاو بۆ لای یەزید گەڕانەوە. مەسلەمە هات و لەکەنارەکانی فورات بەرێکەوت و ڕێگەی خۆی تا ئەنبار بڕی و لەپردەکەی تێپەڕی تا خۆی گەیاندە کوڕی موهەلیب. کەسانێکی زۆر لەخەڵکانی کوفە و سنورنشینەکان پەیوەستی کوڕی موهەلیب بون. بۆ ئەو کەسانەی پەیوەستی ببون و هەروەها سوپای خەڵکانی مەدینە، عەبداللە کوڕی سوفیان کوڕی یەزید کوڕی مەغفەلی ئەزدی کردە فەرماندە، بۆ سوپاکەی مەزحەج و ئەسەد نوعمان کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری کردە فەرماندە، بۆ کیندە و ڕەبیعە محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی ئەشعەس و بۆ تەمیم و هەمەدان حەنزەلە کوڕی عەتاب کوڕی وەرقای تەمیمی کردە فەرماندە و هەموویانی لەژێر فەرماندەیی موفەزەل کوڕی موهەلیب کۆکردەوە. دەبیرخانەی کوڕی موهەلیب ناوی سەد هەزار شەڕکەری تۆمار کرد. وتی: خۆزگە لەجیاتی ئەمانە کەسەکانی خۆم دەبون کە ئێستا لەخوراسان ژیان بەسەر دەبەن. دواتر لەناو ئەوان وتارێکی پێشکەش کرد و ئەوانی بۆ شەڕی هاندا.

عەبدولحەمید کوڕی عەبدولرەحمان لەنوخەیلە ئوردوی لێدابو، ڕوبارەکەی بڕی و

پاسەوانەکانی لەسەر ڕێگەی خەڵکانی کوفە دانا تا پەیوەستی کوڕی موهەلیب نەبن. ئەو دەستەیەکی بەسەرکردایەتی سەبرە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی مێخنەف بۆ شەڕ لەگەڵ مەسلەمە ڕەوانە کردبو. مەسلەمە کەسی ڕەوانە کرد کە عەبدولحەمیدی لەفەرمانداری کوفە لابرد و محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی وەلید کوڕی عوقبەی لەجێگەکەی ئەو دانا.

یەزید سەرانی سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و وتی: بەباشم زانی کە دوانزە هەزار شەڕکەر کۆبکەمەوە و ئەوان لەگەڵ براکەی خۆم محەممەد کوڕی موهەلیب ڕەوانە بکەم تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەنە سەر مەسلەمە و لەگەڵ خۆیان پوش و پەلاش هەڵبگرن تا سەنگەرەکانی ئەوان پربکەنەوە و تا کۆتاییەکانی شەو لەشەڕ کردن بەردەوام بن. دواتر هێزە پشتیوانەکان بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە بکەم و ئەم کارە تا بەرەبەیان بەردەوام بێت. کاتێك بەرەبەیان داهات، لەگەڵ سوپاکەی خۆم هێرشیان بکەمەسەر و بەتەواوی لەناویان ببەم. هیوادارم بەمشێوەیە خوا ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵ بکات. سومیدع وتی: ئێمە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ شێوازی پێغەمبەر(د.خ) و نوسراوی خوامان پێکردن و ئێستا گومان دەکەن بەم بانگەوازەی ئێمە ڕازی بون. شیاو نیە بۆ ئێمە فرت و فێڵ بەکار ببەین یا پەیمان بشکێنین تا لەپەیمانەکەی خۆیان پەشیمان ببنەوە. روبە (سەرکردەی مەرجیەکان) و هاوەڵانی وتی: ڕاست دەکات، دەبێت ئەو کارە بکەین. یەزید وتی: هاوار لەئێوە! ئایا ئومەوییەکان بەراستگۆ دەزانن کە لەسەر بنەمای نوسراوی خواوەند کردوەکانیان ئەنجام بدەن؟ مەگەر ئەوان نەبون لەڕۆژگاری کۆنەوە تا ئێستا، دینیان پێشێل کردوە! ئەوان فریوتان دەدەن و هەڵتاندەخەڵەتێنن. من مەروانیەکانم بینیوە و لەوان فێڵبازتر و پەیمان شکێنترم نەبینیوە و لەناو ئەوان ئەم کولە زەردە (مەسلەمە) لەهەمویان خراپترە. وتیان: شەڕ ناکەین تا لەبەڵێنەکەی خۆیان پەشیمان ببنەوە.

مەروان کوڕی موهەلیب لەبەسرە بو و خەڵکی بۆ شەڕ لەگەڵ خەڵکانی شام هاندەدا. حەسەنی بەسری ڕێگەی ئەو کارەی لێدەگرتن. کاتێك ئەم هەواڵە بەمەروان گەیشت، لەناو خەڵکدا وتارێکی خوێندەوە و ئەوان بۆ هەوڵدان و خۆئامادە کردن هەڵخڕاند. وتی: ئاگاداریان کردومەتەوە کە ئەم پیرە گومڕا خۆ نوێنە(ناوی نەبرد) خەڵك لەم کارە دور دەخاتەوە. سوێند بەخوا ئەگەر دراوسێکەی قامیشێك لەکوخەکەی بدزێت، بەشێوەیەکی

بەردەوام خوێن لەلوتی دێت. سوێند بەخوا یا دەست لەم کارەی هەڵدەگرێت و یاخیە مل ئەستور و پەستە نەزانەکان لەخۆی دور دەکاتەوە یا جەستەی بەسۆهانێکی زبر دەروشێنین.

کاتێك ئەم قسانە بەگوێی حەسەن گەیشت، وتی: سوێند بەخوا حەز ناکەم خوا بەریسوا کردنی ئەو من بەرێز بکات. کەسانێك لەیارانی پێیان وت: ئەگەر مەبەستی تۆ بکات و تۆ بتەوێت، پارێزگاریت لێ دەکەین. بەوانی وت: لەم کاتەدا بۆ کارێك ئێوەم هانداوە کە خۆم رێگەی لێ دەگرم. فەرمانتان پێدەدەم دەست لەکوشت و کوشتاری یەك هەڵبگرن و بۆ هاوکاری کردنی من شەڕ لەگەڵ کەسانی دیکە نەکەن، ئەوسا بڵێم بۆ پاسەوانی کردن لەمن کوشتاری یەك بکەن! ئەم وتانە بەگوێی مەروان گەیشت. کاروباری لەوان سەخت کرد و شوێنیان کەوت و لەدەوری حەسەنی بەسری بڵاوەی پێکردن. دەستی لەحەسەن هەڵگرت.

روبەروو بونەوەی یەزید کوڕی موهەلیب و مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك هەشت رۆژی خایاند. کاتێك رۆژی هەینی چواردەمی صەفەر، ٢٤ ئوتی ٧٢٠ زایینی گەیشت، مەسلەمە کەسی بۆ لای وەزاح رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ کەشتیەکان بێتەدەر و پردەکە ئاگر تێبەربدات. ئەو کارەی کرد. مەسەلە هاتەدەر و سوپاکەی شامی بۆ شەڕ ئامادە کرد و دواتر روبەروی کوڕی موهەلیب بویەوە. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی بەجەبەلە کوڕی مەخرەمەی کێندی و باڵی چەپی بەهوزەیل کوڕی زەفەر کوڕی حارسی کەلابی سپارد. عەباس کوڕی وەلید فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی خۆی بە سەیف کوڕی هانی هەمەدانی و باڵی چەپی بە سوەید کوڕی قەعقاعی تەمیمی بەخشی. فەرماندەی هەمو سوپاکە مەسلەمە بو.

یەزید کوڕی موهەلیب هاتەدەر و فەرماندەی باڵی راستی بەحەبیب کوڕی موهەلیب و باڵی چەپی بە موفەزەل کوڕی موهەلیب سپارد. پیاوێك لەخەڵکانی شام هاتەدەر و داوای روبەروبونەوەی لێکرد. محەممەد کوڕی موهەلیب هاتەدەر و بەشمشێر لێیدا. پیاو دەستی خۆی کردە قەڵغان چونکە دەسکێشی ئاسنینی لەدەستا بو. شمشێرەکە لەدەستی چەقی، باوەشی بەگەردنی ئەسپەکەیدا کرد و هەڵات.

کاتێك وەزاح لەپردەکە نزیك کەوتەوە، ئاگری تێبەردا کە دوکەڵ هاوشێوەی ستونێك

بۆ ئاسمان بەرزبویەوە. خەڵك روبەروی یەك بونەوە و ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند بەڵام بەتەواوەی هێشتا خۆش نەببو. کاتێك خەڵك دوکەڵەکەیان بینی و زانیان پردەکە ئاگری گرتوە، هەڵاتن. بەیەزیدیان وت: خەڵك رایان کرد. وتی: لەترسی چی رایان کرد؟ ئایا شەڕێکی ئەوتۆ رویدا کە شیاوی هەڵاتن بێت؟ پێی وترا: پردەکە ئاگری گرت وکەس توانای خۆڕاگری نیە. وتی: خوا بەنەحلەتیان بکات! مێشولە بون کەدوکەڵیان تێبەردان و هەمویان رایان کرد. دواتر لەگەڵ هاورێکانی هاتەدەر و وتی: قامچی لەروخساری هەڵاتوان بدەن. ئەو کارەیان کرد تا دەستەیەکی فراوان لەدەوری کۆبونەوە و هاوشێوەی کێوێك لای ئەو ریزیان بەست. وتی: وازیان لێ بێنن هیوادرام هیچ کات لەگەڵ ئەوان لەیەك شوێن کۆنەبمەوە. بەرەڵایان بکەن، خوا لێیان خۆش بێت، هاوشێوەی مەڕبون کە گورگ پەلاماریدان و پەرێشانی کردن.

یەزید بیری لەهەڵاتن نەدەکردەوە. یەزید کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاصی سەقەفی (برازای عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاص یاری پێغەمبەر(د.خ) کە لەگەڵ حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص پەیوەندی خزمایەتی نیە) هاتە لای کوڕی موهەلیب و ئەو لەواست بو. پێی وت: پاشایەتی بەنی مەروان بەفیڕۆچو، ئەگەر ئەمە نازانی، بیزانە. وتی: نەمزانیبو. کوڕی حەکەم وتی:

فعش ملكا اومت كريما فام تمت و سيفك مشهور بكفك تعذر

یانی: هاوشێوەی پاشاکان بژی یا وەك کەسێکی رێزدار بمرە چونکە ئەگەر بمریت و شمشێری دەرکێشراوت لەدەستا بێت، پاساوت هەیە.

وتی: ئەگەری هەیە. کاتێك یەزید هەڵاتنی سوپاکەی بینی، وتی: ئەی سومیدەع، بزانە بیرۆکەی من باشتر بو یا بیرۆکەی تۆ؟ پێم نەوتی ئەم خەڵکە چیان دەوێت؟ وتی: بەڵێ. سومەیدەع دابەزی و یەزید و سوپاکەیشی بەهەمان شێوە. دەستەیەك دەڵێن: سوار ئەسپێکی خۆڵەمێشی بو. کەسێك هاتە لای و وتی: براکەت حەبیب کوژرا. وتی: ژیان دوای ئەو سودی نیە، سوێند بەخوا دوای شکست حەزم بەژیان نەدەکرد و ئێستا بەناخۆشتری دەزانم، بۆ پێشەوە برۆن! زانیان کە بەدوای مەرگدا دەگەرێت. ئەو کەسانەی کوژرانیان پەسەند نەدەکرد هێواش هێواش لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد و دەستەیەکی چاکەکار لەگەڵ ئەودا مانەوە و یەزید بەهەمان شێوە پێشڕەوی دەکرد. لای

هەردەستەیەکی سوار کەتێدەپەڕی، ریزەکانیانی تێکدەشکاند و هێرشی دەکردە سەر هەردەستەیەك، هەڵدەهاتن. بەرەو لای مەسلمە پێشڕەوی کرد و جگە لەکوشتنی ئەو مەبەستی هیچی دیکەی نەکرد. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، مەسلمە ئەسپەکەی هێنا تا سواری بێت. سوپا سوارەکەی شام لەدەوری کۆبونەوە. یەزید و سومەیدەع و محەممەد کوڕی موهەلیب کوژران.

پیاوێك لەکەلب لەوێ بو کە پێیان دەوت فەحل کوڕی عەیاش. کاتێك سەیری یەزیدی کرد، وتی: سوێند بەخوا ئەمە یەزیدە، سوێند بە خوا یا دەیکوژم یا دەمکوژێت! ج کەسێکە لەگەڵ من هێرش ببات و هاوەڵانی سەرقاڵ بکات تا بتوانم خۆم بەو بگەیەنم؟ دەستەیەك لەگەڵ ئەو هێرشیان برد و بۆ ماوەیەك شەڕیان کرد و دواتر هەردو دەستە لەدەوری یەزید و ئەو پیاوە بلاوبونەوە، یەزیدیان بەکوژراو بینی و پیاوەکە هێشتا کەمێك گیانی تیا مابو. ئەو دەستی بۆ لای هاوەڵانی خۆی درێژ کرد و یەزیدی نیشاندان کە یانی من یەزیدم کوشت و ئەو منی کوشتوە.

کۆیلەیەك لەبەنی مورە سەری یەزیدی هێنا. پێی وترا: تۆ ئەوت کوشت؟ وتی: نە. کاتێك بردیانە لای مەسلەمە، بەخالید کوڕی عوقبە کوڕی ئەبی موعیت بۆ یەزید کوڕی عەبدولمەلیکی رەوانە کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو هوزەیل کوڕی زەفەر کوڕی حارسی کەلابی ئەوی کوشت بەلام لەبەر لەخۆرازی بون، سەری نەبڕی.

کاتێك یەزید کوژرا، موفەزەل کوڕی موهەلیب شەڕی لەگەڵ شامیەکان دەکرد و لەکوژرانی براکەی و شکستی سوپاکەی ئاگادار نەبو. هەرجار کە هێرشی دەکردە سەر شامیەکان، لەدەوری ئەو بلاوەیان دەکرد و ئەو دوبارە هێرشی دەبرد و لەقولایی سوپاکەیان پێشڕەوی دەکرد. عامر کوڕی عەمەیسەلی ئەزدی لەگەڵ ئەو شمشێری دەوەشاند و دەیوت:

قد علمت ام الصبی المولود　　　انی بنصل السیف غیر رعدید

یانی: دایکی منالی کەم تەمەن بەباشی دەزانێت من لەتیژی دەمی شمشێرەکان ناترسم.

ماوەیەك شەڕیان کرد کە خەڵکی رەبیعە شکستیان خوارد. موفەزەل روی تێکرد و هاواری کرد: هێرش بەرەن، هێرش! سوێند بەخوا هیچ کات هەڵاتو نەبون و ئەمە

عادەتی ئێوە نیە، با عێراقیەکان بەهۆی ئێوە زیانیان پێ نەگات، گیانم قوربانی ئێوە بێت! گەڕانەوە و مەبەستی هێرش کردنیان کرد. کەسێك هاتە لای و وتی: زۆر دەمێکەیە یەزید و محەممەد و حەبیب کوژراون وخەڵك هەلاتون، تۆ لێرە چی دەکەیت؟ خەڵك لەدەوری ئەو بلاوەیان لێکرد و موفەزەل بەرەو واست بەرێکەوت. لەناو عەرەبەکان کەس لەو شمشێر وەشێنتر و تێکۆشەرتر بۆ کۆکردنەوەی خەڵکان نەبو و نەبینراوە. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵکو براکەی عەبدولەلیك هات و نەیویست لەکوشتنی براکەی ئاگاداری بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەویش ئارەزومەندی مەرگ نەبێت. لەبەر ئەمە پێی وت: سەروەرمان بەرەو واست بەرێکەوتوە. موفەزەل لەگەڵ پاشماوەی منالەکانی موهەلیب بەرەو واست بەرێکەوت و کاتێك لەکوژرانی یەزید ئاگادار بویەوە سوێندی خوارد کەهەرگیز لەگەڵ عەبدولەلیك قسە نەکات. قسەی لەگەڵ نەکرد تا لەقەندابیل کوژرا. چاوی لەشەڕەکە برینداربو و دەیوت: عەبدولەلیك منی ریسوا کرد چونکە خەڵکان منیان بینی و وتیان: ئەمە پیرەپیاوە یەك چاوە تێکشکاوەکە! بۆ راستی بەمن نەوت تا خۆم بەکوشت بدەم؟ دواتر وتی:

ولا خیر فی طعن الصنادید بالقنا          و لا فی القاء الحرب بعد یزید

یانی: کوشتنی پاڵەوانەکان بە رمە گیان ستێنەکان و شەڕ کردن لەگۆڕەپانی شەڕ، دوای یەزید، ناخۆشە و هۆکاری دڵتەنگیە.

کاتێك موفەزەل لەگۆڕەپان هێنرایەدەر، سوپاکەی شام هاتنە ناو لەشکرگەکەی یەزید. ئەبو روبە سەرکردەی مەرجیەکان ماوەیەك لەرۆژ شەڕی لەگەڵ کردن. مەسلەمە نزیکەی سێسەد کەسی بەئەسیری گرت و رەوانەی کوفەی کرد کە لەوێ زیندانی کران. نامەی یەزید کوڕی عەبدولەلیك بەمحەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی وەلید گەیشت و فەرمانیدا ئەسیرەکان بکوژن. ئەو بە عوریان کوڕی هەیسەم سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی فەرمانیدا بیست بیست و سی سی ئەوان بێنێتەدەر و سەریان ببرێت. نزیکەی سی کەس لەتەمیمیەکان هەستان و وتیان: ئێمە بوینە هۆکاری تێکشکانی خەڵکان، لەئێمەوە دەستپێبکەن وپێش کەسانیتر ئێمە بکوژن. عوریان ئەوانی هێنایەدەر و سەری برین و ئەوان بەردەوام دەیانوت: بۆینە هۆکاری شکستی خەڵکان و ئەمە سزاکەمان بو. کاتێك لەکوشتنی ئەوان تەواو بون، نێردراو بەفەرمانی مەسلەمەوە گەیشت کە فەرمانی دەدا

دەست لەکوشتنی ئەسیرەکان هەڵبگرن. مەسلەمە لەحیرە دابەزی.

کاتێك هەواڵی شکست و کوژرانی یەزید بە شاری واست گەیشت، کورەکەی معاویە سی و دو ئەسیری هێنایەدەر و سەری برین، لەناو ئەوان: عودەی کوڕی ئەرتات، محەممەد کوڕی عودەی کوڕی ئەرتات، مالیك کوڕی مێسمەع، عەبدولەلیك کوڕی مێسمەع و کەسانی دیکە. دواتر بەرەو بەسرە بەرێکەوت و سامان و گەنجینەی لەگەڵ خۆی هەلگرت. موفەزەل کوڕی موهەلیبیش گەیشت. کەسانی موهەلیب لەبەسرە کۆبونەوە و کەشتیەکانیان ئامادە کرد و چاوەڕوانی ڕۆشتن بۆ ناو دەریایان دەکرد. یەزید کوڕی موهەلیب، وەداع کوڕی حومیدی ئەزدی وەك فەرمانداری قەندابیل دەستنیشان و پێی وتبو: من بۆ شەڕی ئەم دوژمنانە دەرۆم و ئەگەر روبەرویان دەبومەوە، لەگۆڕەپان نەدەهاتمەدەر تا کۆتایی ژیانی من بگات. ئەگەر سەرکەوتم ڕێزت لێ دەگرم و ئەگەر کوژرام تۆ لەقەندابیل دەمێنیتەوە تا کەسانی بنەماڵەکەی من بگەنە لای تۆ و لەوێ بمێننەوە تا ئەمان وەردەگرن. من لەناو هەمو کەسەکانم تۆم هەڵبژارد و هیوادارم بۆ ئەم کارە شیاو بیت. سوێند و بەڵێنی لێ وەرگرت ئەگەر کەسانی بنەماڵەکەی پەنایان بۆبرد، چاکەیان لەگەڵدا بکات.

کاتێك کەسان و بنەماڵەی یەزید کوڕی موهەلیب لەبەسرە کۆبونەوە، ژنان و سامانەکانی خۆیان بۆ ناو کەشتیەکان برد و ڕۆشتنە قوڵایی دەریا تا گەشتنە دەوروبەری کرمان. لەکەشتیەکان دابەزین و ژنان و سامانەکانی خۆیان سوار چوارپێکان کرد. مەفەزەل کوڕی موهەلیب لەپێش ئەوانەوە بەرێگادا دەرۆشت. هەلأتوانێکی زۆر لەکرمان ژیانیان بەسەر دەبرد کە لەدەوری موفەزەل کۆبونەوە. مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك ، مەدرەك کوڕی زەبی کەلبی بەدوای ئەو و هەلأتوان رەوانە کرد. مەدرەك موفەزەلی بینی و هەلأتوان لەسەر گەردەنەیەك هاورێیەتیان دەکرد. گەڕانەوە و لەگەڵ مەدرەك و سوپاکەی شەڕیان کرد و شەڕەکەیان بەرەو دژواری ڕۆشت. لەیارانی موفەزەل دو کەس کوژران:، ئەعمان کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری ئەخەعی و محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس. پاشای کەهستان، صول بەئەسیری گیرا. عوسمان کوڕی ئیسحاق کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس بریندار بو وهەلأت تا گەیشتە حولوان. ڕێنومایی سوپاکەی مەسلەمەیان کرد کەئەویان گرت و کوشتیان و سەریان بۆ مەسلەمە

لەحیرە رەوانە کرد. کەسانێك لەهاوەڵانی کوڕی موهەلیب گەڕانەوە و داوای ئەمانیان کرد وپێیان بەخشرا، لەناو ئەوان: مالك کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر، وەرد کوڕی عەبداللە کوڕی حەبیبی سەعدی تەمیمی و کەسانیتر.

بنەماڵەی موهەلیب و هاورێکانیان ڕۆشتنە قەندابیل. مەسلەمە کەسی بەدوای مەدرەك کوڕی زەب رەوانە کرد و ئەوی گەڕاندەوە و هیلال کوڕی ئەحوزی تەمیمی بەدوای ئەواندا رەوانە کرد کە لەقەندابیل خۆی بەوان گەیاند. کەسانی موهەلیب مەبەستی ئەوەیان کرد بڕۆنە ناو ئەو شارە بەڵام وەداع کوڕی حەمید رێگەی لێگرتن. هیلال کوڕی ئەحوز لەبنەماڵەی موهەلبیب نەپچڕابو. کاتێك روبەروی یەك بونەوە، وەداع لەباڵی راست بو و عەبدولەلیك کوڕی هیلال لەباڵی چەپ. ئەم دوانە هەردوکیان ئەزدی بون. هیلال کوڕی ئەحوز ئاڵای ئەمانی هەڵکرد. وەداع کوڕی حەمید و عەبدولەلیك کوڕی هیلال ڕۆشتنە ژێر ئاڵاکە و خەڵکان لەدەوری بنەماڵەی موهەلیب بڵاوبونەوە. کاتێك مەروان کوڕی موهەلیب ئەمەی بینی، مەبەستی کوشتنی ژنەکانی کرد تا نەکەونە دەست سوپاکەی مەسلەمە. موفەزەل رێگەی ئەم کارەی لێگرت و وتی: ئەوان لەلایەن ئەم خەڵکەوە ترسیان لەسەر نیە. ئەو ژنەکانی نەکوشت. دواتر شمشێرەکانی خۆیان هەڵگرت و شەڕیان کرد وتا دوایین کەسیان کوژرا: موفەزەل کوڕی موهەلیب، عەبدولەلیك کوڕی موهەلیب، زیاد کوڕی موهەلیب، مەروان کوڕی موهەلیب، معاویە کوڕی یەزید کوڕی موهەلیب، مێنهال کوڕی ئەبی عۆیەیینە کوڕی موهەلیب، عەمرۆ کوڕی قەبیصە کوڕی موهەلیب و موغەیرە کوڕی موهەلیب. سەری ئەوانیان بڕی و ناوی هەرکامیان لەسەر کاغەزێك نوسی وکردیانە ناو کونی گوێچکەیان. ئەمانە جگە لە ئەبو عۆیەیینە کوڕی موهەلیب و عومەر کوڕی یەزید کوڕی موهەلیب و عوسمان کوڕی موفەزەل کوڕی موهەلیب بون کە پەنایان بۆ رۆتبیل برد. هیلال کوڕی ئەحوز مناڵ و ژن و سەری براوی بنەماڵەی موهەلبی بۆ لای مەسلمە لەحیرە رەوانە کرد. مەسلەمەیش بۆ یەزیدی نارد و ئەویش بۆ لای عەباس کوڕی وەلید فەرمانداری حەلەب کە سەرەکانی بەنوکی ڕمەکانەوە کرد و لەناو شاردا هەڵیکردن. مەسلەمە بڕیاریدا ژن و مناڵەکان بفرۆشێت. جەراح کوڕی عەبداللە حەکەمی ئەوانی بەسەد هەزار دینار کڕی و ئازادی کردن و مەسلەمە هیچی لەجەراح وەرنەگرت.

کاتێك هەواڵی کوژرانی یەزید کوڕی موهەلیب بەیەزید کوڕی عەبدولمەلیك گەیشت، لەم سەرکەوتنە شادمان بو و کاتێك تۆڵەی خۆی لەو لەرۆژگاری پێش خەلافەتی خۆی وەرگرتەوە، شادانتر بو.

هۆکاری دوژمنی ئەم دوانە ئەوە بو کە کوڕی موهەلیب رۆژێك لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك لەگەرماو هاتەدەر و (غالیەی) زۆری بەسەر و روی خۆیدا پرژاند و لای یەزید کوڕی عەبدولمەلیك (کە لای عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دانیشتبو) تێپەڕی کرد. یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز وتی: خوا ئەم دنیایە لەناو ببات، خۆزگە غالیە یەك مسقاڵی بەهەزار دینار دەبو و جگە لەرێزدارەکان کەس نەیدەتوانی بیکرێت! کوڕی موهەلیب بیستی و وتی: خۆزگە غالیە لەقورگی شێردا دەبو کە جگە لەمن کەس نەیدەتوانی بەدەستی بێنێت. یەزید کوڕی عەبدولمەلیك پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر رۆژێك بێمەسەر کار، بێ چەند و چون تۆ دەکوژم. کوڕی موهەلیب وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بێیتە سەرکار، بەپەنجا هەزار شمشێر هێرش دەکەمە سەرت. ئەمە هۆکاری دوژمنایەتی نێوانیان بو. ئاماژەیان بە بەسەرهاتی دیکەداوە کە پێشتر ئاماژەمان پێدا.

ئەسیرەکان سیانزە کەس بون. کاتێك ئەوانیان بردە لای یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، کەسێر عێزەت وتی:

| | |
|---|---|
| حليم اذا ما نال عاقب مجملا | اشد عقاب او عفا لم يثرب |
| فعفوا امير المومنين و حسبة | فما تاته من صالح لك يكتب |
| اساؤوا فان تصفح فانك قادر | و افضل حلم حسبة حلم مغضب |

یانی: خۆراگرێکی لێبورە کەکاتێك سزا بدات، لەرێگەی چاکەکاریەوە دژوارترین سزاکان دەدات یا خۆش دەبێت و سەرکۆنە ناکات. بیانبەخشە ئەی سەروەری باوەڕداران، پاداشت لەخوا بوێت، چونکە هەر کارێکی چاکە کەئەنجامی بدەیت، بۆت دەنوسرێت. خراپەیان کرد، ئەگەر ببەخشیت، بۆ ئەو کارە بەتوانایت، لەپێشترین خۆڕاگری، لەروانگەی پاداش، بەخششی پیاوی توڕەیە.

یەزید کوڕی عەبدولمەلیك پێی وت: ئەی ئەبو صەخر، مەبەستەکەت دوورە! خزمایەتی بۆ خۆت بپارێزە چونکە هیچ رێگەیەك بۆ بەخشینی ئەوان نیە. خوای گەورە

ئەوانی بەکارە ڤێزەونەکانیانەوە بۆ لای من رەوانە کردوە. دواتر فەرمانی کوشتنی ئەوانیدا. کوڕێکی منالْ مایەوە کەوتی: بمکوژن چونکە منالْ نیم. یەزید وتی: بزانن توکی بەری رواوە یا نە. کوڕ وتی: خۆم باشتر دەزانم. لەخەودا ژنم بینیوە و لەگەڵیدا جوت بوم (مەبەست شەیتانی بونە). یەزید فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

ناوی ئەسیرە کوژراوەکان بەم شێوە بو: موعارك کوڕی یەزید کوڕی موهەلیب، عەبدالله کوڕی یەزید، موغەیرە کوڕی یەزید، موفەزەل کوڕی یەزید، مێنجاب کوڕی موفەزەل، دورەید کوڕی موفەزەل کوڕی موهەلیب، حەجاج کوڕی موفەزەل، غەسان کوڕی موفەزەل، شەبیب کوڕی موفەزەل، فەزل کوڕی موفەزەل و موفەزەل کوڕی ڤەبیسە کوڕی موفەزەل. سابت کوڕی ڤوتنە لەپرسەی یەزید کوڕی موهەلیب وتی:

ابی طول هذا الليل ان يتصرما   وهاج لك الهم الفواد المتيما

ارقت و لم تارق معی ام خالد   و قد ارقت عيناى حولا مجرما

على هالك هد العشيرة فقده   دعته المنايا فاستجاب و سلما

على ملك بالعقر يا صاح جنبت   كتائبه و استورد الموت معلما

اصيب و لم اشهد و لو كنت شاهدا   لسلبت ان لم يجمع الحی ماتما

و فی غير الايام يا هند فاعلمی   لطالب و تر نظرة ان تلوما

فعلی ان مالت بی الريح ميلة   علی ابن ابی ذبان ان يتندما

امسلم ان تقدر عليك رماحنا   ننذقك بها فی الاساود مسلما

و ان نلق للعباس فی الدهر عثرة   نكافئة باليوم الذی كان قدما

قصاصا و لم نعد الذی كان قد اتی   الينا و ان كان ابن مروان اظلما

ستعلم ان زلت بك النعل زلة   و اظهر اقوام حياء مجمجما

من الظالم الجانی علی اهل بيته   اذا احضرت اسباب امر و ابهما

و انا لعطافون بالحلم بعد ما   تری الجهل من فرط اللئيم تكرما

و انا لحلالدن بالثغر لا نری   به ساكنا الا الخميس العرمر ما

نری ان للجيران حقا و ذمة   اذا الناس لم يرعوالذی الجار محرما

و انا لنقری الضيف من قمع الذری   اذا كان رفد الرافدين تجشما

یانی: درێژایی شەو لەڕۆشتن بەرەو کۆتاییەکەی لەجووڵە کەوت و خەم، دڵی

سوتاوی تۆی دەکولاند. بەناگا مامەوە بەلام دلدارەکەم دایکی خالید لەگەلم بەئاگا نەمایەوە، چاوەکانم بۆ یەك ساڵی رەبەق خەویان لێ نەکەوت. ئەمە لەحەسرەتی پیاوێکی رێزدار بو کە کوژرانی هەمو خەلکی راچلەکاند، مەرگ بانگی کرد و وەلامی دایەوە. هاورێی من، ئەم داخ بۆ مەرگی پاشایەك بوو کە لەگۆرەپانی شەڕ گیانی بەخشی و دەستە شەرکەرەکانی ترسابون و ئەو هاوشێوەی پالەوانێك بەرەو ئامێزی مەرگ غاریدا. لەخاك و خوێندا گەوزا و من لەوێ نەبوم و ئەگەر شایەتی مەرگی دەبوم و کەسەکانم پرسەیان بۆ نەدەگێرا، خۆم بەتەنیا جل وبەرگی پرسەم لەبەر دەکرد. لەسورانی رۆژگارەکان (ئەمە بزانە ئەی هند) خوازیاری خوێن، ئەگەر چاوەرێ بێت، زانایییەکی قوولی هەیە. ئەگەری هەیە ئەگەر بابی روداوەکان من بسورێنێت و لای کوری باوکی زەبان تێپەرم بکات، کارێك بکەم کە لەبونی خۆی پەشیمان ببێتەوە. ئەی مەسلەمە، ئەگەر رمەکانی ئێمە بەتۆ بگەن، ژەهری ماری زەنگیت پێ دەچێژن بەشێوەیەك بێ یار و پشتیوان بمێنیتەوە. ئەگەر لەعەباس هەلەیەك ببینین، لەبەرابەر ئەو رۆژە، سزایەکی بەرچاوی پێ دەبەخشین. بەپێی ئاییني تۆلە سەندنەوە ئەو کارە دەکەین و لەوەی ئەنجامی داوە، خۆش نابین چونکە کوری مەروان ستەمکارترە. بەم زوانە، ئەگەر پێلاوەکان لەقاچتا بخلیسکێت و کەسانێك لەخەلك شەرمێکی شاراوە ئاشکرا بکەن، بزانە کە ستەمکاری گوناحکار لەسەر بنەمالەکەی کێیە، ئەمە لەکاتێکدایە کە هۆکارەکانی کارێك یەك دەگرن و دواتر بەرەو تاریکی دەروات. ئێمە لایەنگرانی خوێنساردی و خۆراگرین و لەبەرچاو نەگرتنی گوناحی گوناحکاری پەست بەجۆرێك لەرێزداری دەزانین. لەو سنورانەدا نیشتەجێین کە هیچ کەس لەوێ نیشتەجێ نابێت مەگەر ئەوەی سوپایەکی گەورە روو لەو دیارە بکات. دەبینم کە دراوسێکان ماف و ئەمانیان هەیە، ئەگەر چی خەلکان بەشێوەیەکی شیاو رێز لەدۆستایەتی و دراوسێیەتی ناگرن. بەفرمێسکی چاو میوانداری میوانەکان دەکەین ئەوکاتەی بەخشەرەکان کۆتایی بەبەخشینەکانیان بێنن.

بۆ پرسەی ئەو چەندین قەسیدەی هۆنیوەتەوە.

بەلام ئەبو عۆیەیینە کوری موهەلیب، هند کچی موهەلیبی بۆ لای یەزید کوری عەبدولەلیك رەوانە کرد و داوای ئەمانی کرد کە ئەمانی پێ بەخشی. عومەر کوری

یەزید کوڕی موهەلیب و عوسمان کوڕی موفەزەل کوڕی موهەلیب زیندو مانەوە تا ئەسەد کوڕی عەبدالله‌ی قەسری بو بەفەرمانداری خوراسان و ئەمان نامەی بۆ ئەو دوانە رەوانە کرد کە هاتنە خوراسان.

## دانانی مەسلەمە لەعێراق و خوراسان

کاتێك مەسلەمە لەشەڕی یەزید کوڕی موهەلیب تەواو بو، براکەی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك فەرمانڕەوایی کوفە و بەسرە و خوراسانی پێبەخشی. ئەو محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی وەلیدی وەك کارگوزاری خۆی لەکوفە دەستنیشان کرد. دوای بنەماڵەی موهەلیب، شەبیب کوڕی حارسی تەمیمی کاروبارەکانی بەسرەی هەڵدەسوراند. مەسلەمە، عەبدولرەحمان کوڕی سلێمانی کەلبی وەك فەرمانداری ئەو شارە دەستنیشان کرد و عەمرۆ کوڕی یەزیدی تەمیمی کردە سەرکردەی پاسەوانەکان. عەبدولرەحمان مەبەستی ئەوەی کرد خەڵکانی بەسرە ببینێت و گوشتاریان بکات بەڵام عەمرۆ کوڕی یەزید رێگەی ئەو کارەی لێگرت و داوای دە رۆژ مۆڵەتی کرد و ئەم هەواڵەی بۆ مەسلەمە نوسیی. مەسلەمە ئەوی لابرد و عەبدولمەلیك کوڕی بیشر کوڕی مەروانی لەجیگەی ئەودانا و عەمرۆ کوڕی یەزیدی وەك سەرکردەی پاسەوانەکان هێشتەوە.

## دەستنیشان کردنی سەعید خوزەینە لەخوراسان

مەسلەمە، سەعید کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی حارس کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص کوڕی ئومەییە کەپێیان دەوت سەعیدی خوزەینە، وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشانی کرد. بۆیە بەو ناوە بانگیان دەکرد چونکە پیاوێکی نەرم و بەتوانا بو. پاشای ئەبغەر ڕۆشتە لای و بینی کە جل وبەرگی ڕەنگاورەنگی لەبەر کردوە و دەوروبەری پڕە لەدۆشەك و پشتیە ڕەنگینەکان. کاتێك هاتەدەر، پێیان ون: سەروەری ئێمەت چۆن بینی؟ وتی: خوزەینە بو. لەو ڕۆژەوە بەخوزەینە ناویان دەبرد. خوزەینە خاتونی دێدار یا کەیبانوە.

سەعید کچی مەسلەمەی کردبوە هاوسەری خۆی و لەبەر ئەمە بو ئەوی کردە فەرمانداری خوراسان. کاتێك مەسلەمە سەعیدی بۆ ئەو کارە ڕاسپارد، بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت و شوعبە کوڕی زوهەیری ئەهشەلی وەك فەرمانداری سەمەرقەند دیاری کرد. بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت و ڕۆشتە سەغد. خەڵکەکەی لەرۆژگاری عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم ناباوەڕ ببون. دواتر پاشگەز بونەوە و ڕێزیان لەپەیمانی ئاشتیەکە گرت. شوعبە لەناو خەڵکانی سەغد وتارێکیدا و دانیشتوانی عەرەب نەژادی سەرکۆنە کرد و ئەوانی بەترسنۆك لەقەڵەمدا و وتی: لەناو ئێوەدا نەپیاوێکی بریندار دەبینم نە ناڵەی ئازارێك. داوای لێخۆشبونیان کرد و فەرماندارەکەیان عێلبا ءکوڕی حەبیبی عەبدیان بەلاواز لەقەڵەمدا.

سەعید کارگوزارەکانی عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللەی کە لەرۆژگاری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتبونە سەرکار، خستە زیندان و دواتر ئازادی کردن. دواتر سەعیدیان ئاگادار کردەوە کە جەهم کوڕی زەحری جوعفی و عەبدولعەزیز کوڕی عەمرۆ کوڕی حەجاجی زەبیدی و مونتەجیع کوڕی عەبدولرەحمان ئەزدی (تا هەشت کەس) لەلایەن یەزید کوڕی موهەلیب بۆ کارە دژوارەکان دیاری کراون و لای ئەوان سامانێکی زۆری موسوڵمانان کەڵەکە کراوە کە بەخیانەت هەڵیانگرتوە. کەسی ڕەوانە کرد و ئەوانی لە (قەڵای کۆن) لەمەرو زیندانی کرد. جەهم کوڕی زەحری سوار کەرێك کرد و لەناو شاردا

سوراندی و سەد قامچی لێدا و فەرمانی دەرکرد ئەو و هەشت کەسەکەی دیکە بەوەرقا ء کوڕی ئەصر بسپێرن تا ئەشکەنجەیان بکات. وەرقا عداوای لێبوردنی کرد و سەعید ئەوی بەخشی و ئەوانی بە عەبدولحەمید کوڕی دێسار و عەبدولەلیك کوڕی دێسار و زوبەیر کوڕی ئەشیت موالی باهلە سپارد کە جەهم کوڕی زەحر و عەبدولعەزیز کوڕی عەمرۆ مونتەجیع کوڕی عەبدولرەحمانیان لەژێر ئەشکەنجەدا کوشت و قەعقاع وکەسانی دیکەیان تا سنوری مەرگ ئەشکەنجە کرد. ئەوان لەناو زینداندا بون کە تورکەکان و سەغدیەکان بۆ شەڕی عەرەبەکان پێشڕەویان کرد و سەعید فەرمانیدا و ئازادی کردن. دەیوت: خوا زوبەیر نفرین بکات کە جەهمی کوشت.

## وەرگرتنی بەیعەت بۆ جێنشینی هوشام و وەلید

کاتێك یەزید کوڕی عەبدولەلیك سوپای بۆ شەڕی یەزید کوڕی موهەلیب ڕەوانە کرد (کە ئاماژەمان پێدا) و دواتر مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك و عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولەلیکی کردە فەرماندەی سوپاکەی خۆی، پێیان وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، عێراقیەکان خەڵکانێکی پەیمان شکێن وناژاوەچین، ئێمە ڕوبەڕوی جەنگێکی مەترسیدار بوینەتەوە و ئەگەری هەیە ڕوداوەکان ڕوبدات و ئێمە لەوە دڵنیا نین کەعێراقیەکان شۆڕش بکەن و بڵێن: سەروەری باوەڕداران مرد، دواتر هێزی ئێمە تێکبشکێت و سوپاکەمان بڵاوەی لێبکەن، ئەگەر هاوشێوەی عەبدولعەزیز کوڕی وەلید وەسیەتت دەکرد، کارێکی باشت ئەنجامداوە.

ئەم هەواڵە بەمەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك گەیشت. ئەو هاتە لای براکەی یەزید و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کامیان لای تۆ بەرێزترە، براکەت یا برازاکەت؟ وتی: براکەم. وتی: کەواتە براکەت بۆ خەلافەت شیاوترە. یەزید وتی: ئەگەر کوڕم نەدەبو، براکەم بۆ ئەو کارە شیاوترە بو تا برازاکەم. وتی: کوڕەکەت هێشتا گەنجە، لەگەڵ هوشام کوڕی عەبدولەلیك بۆ خەلافەت بەیعەت بکە و دوای ئەو بۆ کوڕەکەت وەلید بەیعەت وەربگرە. وەلید کوڕی یەزید لەو کاتەدا تەمەنی پانزە ساڵ بو. ئەو بۆ هوشام کوڕی عەبدولەلیك و دواتر بۆ کوڕەکەی وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولەلیك بەیعەتی وەرگرت. یەزید تەمەنی درێژەی کێشا و کوڕەکەی پێگەیشت. هەرجار کە یەزید ئەوی دەبینی، دەیوت: خوا داوەری نێوان من و کەسێك بێت کە هوشامی لەنێوان من و تۆ

جێگە کردەوە.

## شەڕی تورکەکان

کاتێك سەعید بو بەفەرماندارى خوراسان، خەڵك ئەویان بەسست و ناتەوان لەقەڵەمدا و بە خوزەینە ناویان برد. شوعبەی وەك فەرماندارى سەمەرقەند دیاری کرد و دواتر لەو کارە دوری خستەوە. تورکەکان چاوی تەماحیان لەو سەرزەمینە بڕی و خاقان ئەوانی کۆکردەوە و بەرەو سەغد رەوانەی کردن. کورصول فەرماندەی تورکەکان بو. بەرێکەوتن تا لەکۆشکی باهلی دابەزین.

دەستەیەك دەڵێن: گەورەیەك لەگەورەکان داوای ژنێکی لەباهلە کرد کە لەو کۆشکەدا ژیانی بەسەر دەبرد. ژن رازی نەبو و پیاوەکە تورە بو. هیوادار‌بون دانیشتوانی ئەو کۆشکە بەئەسیری بگرن. کورصول هات و گەمارۆی خستە سەر دانیشتوانی کۆشك کە نزیکەی سەد بنەماڵە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان لەوێ دەژیان. لەسەمەرقەند عوسمان کوڕی عەبداللە کوڕی موتەریف کوڕی شەخیر فەرماندار بو کەسەعید دوای شوعبە بۆ ئەو کارە رایسپارد. نامەیان بۆ نوسی. ترسان کە هێزە پشتیوانەکان درەنگ بگەنە لایان. لەبەر ئەمە لەگەڵ تورکەکان لەسەر پێدانی چل هەزار (دینار یا درەم؟) ئاشتیان کرد و حەفەدە کەسیان وەك بارمتە تەسلیمی ئەوان کرد. عوسمان خەڵکی کۆکردەوە و موسەییب کوڕی بیشری ریاحی خۆبەخشانە خۆی بۆ شەڕ ناونوس کرد و لەگەڵ ئەو چوار هەزار کەس بەهەمان شێوە خوازیاری رۆشتن بۆ شەڕ بون لەناو ئەوان شوعبە کوڕی زوهەیر و سابت کوڕی قوتنە لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەپاڵەوانە بەئەزمونەکان. کاتێك ئوردویان لێدا، موسەییب بەوانی وت: ئێوە دەڕۆنە شەڕی سوارکارە تورکەکان کە فەرماندەکەیان خاقانە. پاداشی کارەکەتان ئەگەر خۆڕاگری بکەن، بەهەشتە و سزاکەتان ئەگەر رابکەن، ئاگر. هەرکەس مەبەستی شەڕ و خۆڕاگری هەیە، هەنگاو بنێتە پێش. هەزار و سێسەد کەس پاشگەز بونەوە. چەند فەرسەخێك رێگەیان بڕی، دوبارە وتاری یەکەمی هێنایە سەرزمان و هەزار کەسی دیکە پاشگەز بونەوە. فەرسخێکی دیکە بەرێگادا رۆشت و قسەکانی دوبارە کردەوە و هەزار شەڕکەری دیکەیش پاشگەز بونەوە. بەرێکەوت تا گەیشتە دو فەرسەخی ئەوان و دابەزی. تورکی خاگان پاشا (فی) هاتە لای ئەوان و وتی: لێرە هیچ دێدارێك نەمایەوە مەگەر ئەوەی لەگەڵ تورکەکان بەیعەتی کرد

جگە لەمن کە سێسەد شەڕکەرەم لەژێر فەرماندایە. ئەوان لەگەڵ تۆدان و من هەواڵێکم پێیە. ئەوان ئاشتیان لەگەڵ تورکەکان کرد و حەفدە کەسیان وەك بارمتە لای ئەوان دانا تا پەیمانی ئاشتیان لێ وەربگرن. کاتێك بیستیان ئێوە بەرێکەوتون، بارمتەکانیان کوشت، بەیانی بۆ شەڕ روبەروی یەك دەبنەوە تا دەست بەسەر کۆشکەکەدا بگرن.

موسەییب دوپیاوی رەوانە کرد، پیاوێك لەعەرەبەکان وپیاوێك لەپارسەکان، ئەوان بەرێکەوتن تا باس و خواسەکانی ئەو خەڵکە بێنن. لەشەوی تاریکدا بەرێکەوتن کە تورکەکان لەدەوروبەری کۆشکەکە ئاویان کۆکردبویەوە و کەس نەیدەتوانی دەستی بەوێ بگات. لەکۆشکەکە نزیك کەوتنەوە کە پێشەنگەکانیان بانگیان کردن. پێیان وت: بێدەنگ بە و عەبدولەلیك کوڕی دێسار بۆ لای ئێمە بنێرە. ئەوی بانگ کرد. ئاگاداریان کردەوە کە موسەییب لەم نزیکانەیە. وتیان: ئایا دەتوانن ئەمشەو تا بەیانی پارێزگاری لەخۆتان بکەن؟ وتیان: مەبەستی ئەوەمان کردوە پێش خۆمان ژنەکانمان بەرەو مردن پێش بخەین و دواتر هەمومان گیان ببەخشین. ئەو دوانە بۆ لای موسییب گەڕانەوە و ئاگاداریان کردەوە. بەهاوەڵانی وت: من بۆ شەڕی ئەم خەڵکە دەڕۆم، هەرکەس دەیەوێت جیا ببێتەوە، رێگەی خۆی بگرێتەبەر. کەس جیانەبویەوە و هەمویان بۆ مەرگ پەیمانیان لەگەڵ بەست.

بەیانی بویەوە و کۆشکەکە لەو ئاوەی تورکەکان هەڵیانبەستبو، بەهێزتر ببو. کاتێك تەنیا نیو فەرسەخ لەتورکەکان دور بوو، دابەزی و مەبەستی ئەوەی کرد شەوانە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەریان. کاتێك شەو داهات، داوای خۆڕاگری لەشەڕکەرانی کرد و وتی: دەبێت دروشمەکەتان (یا محەممەد) بێت. شوێن هەڵاتوان مەکەون، چوارپێکانیان لەناو ببەن چونکە کاتێك ئەسپەکانی خۆیان لەدەست بدەن، بەبوونی ئێوە زیاتر زیانیان بەردەکەوێت، هێزی ئێوە کەم نیە. ئەگەر حەوتسەد شمشێر لەناکاو هێرش بکاتە سەر سوپایەك، تێکی دەشکێنێت هەرچەند ژمارەکەی فراوان بێت. کەسیری دەبوسی کردە فەرماندەی باڵی راستی خۆی و سابت کوڕی قوتنەی کردە فەرماندەی باڵی چەپ کە لەخەڵکانی ئەزد بوو. کاتێك لەوان نزیك کەوتنەوە(و ئەمە لەکاتی بەرەبەیان بو) تەکبیریان وت. تورکەکان راچڵەکان و موسوڵمانان هێرشیان کرد و چوارپێکانیان لەناوبرد. موسەییب و شەڕکەرانی هاورێی دابەزین و بەو پەڕی هێزیانەوە

شەڕیان کرد. دەستی ڕاستی بەختەری مەرایی فڕتا کە شمشێری بەدەستی چەپی گرت و ئەو دەستەیشیان فڕتاند و لەشەڕ کردن بەردەوام بوو تا کوژرا. سابت کوڕی قوتنە گەورەیەك لەگەورەکانی تورکی کوشت و تورکەکان هەڵاتن و جارچی موسەییب جاڕیدا: شوێنیان مەکەون چونکە لەترسا نازانن ئێوە شوێنیان کەوتون یا نە، مەبەستی کۆشك بکەن و جگە لەناو هیچ شتێك هەڵمەگرن و ئەو کەسانە پێش خۆتان بخەن کەدەتوانن بەرێگادا بڕۆن. هەرکەس ژن یا منداڵێك یا ناتەوانێك بەهیوایی پاداشتی ئەو دنیا هەڵبگرێت، پاداشتەکەی لای خوایە و هەر کەس نەخوازێت، چل درەمی پێ بدەن، ئەگەر لەکۆشك لەئەمان بەخشراوەکان کەسی لێبو، ئەوانیش ڕزگار بکەن. کۆشك نشینەکانیان هەڵگرت و ڕۆشتنە لای خەڵکان. ئەوانی لەکۆشەکەی جێگە کردەوە و خواردنی پێدان. دواتر ڕەوانەی سەمەرقەند بون. بۆ بەیانی تورکەکان گەڕانەوە بەڵام کەسیان لەکۆشکەکە نەبینی جگە لەکوژراوەکانی خۆیان. وتیان: ئەوانەی هێرشیان کردە سەر ئێمە، لەخەڵکان نەبون، بەڵکو لەپەریەکان بون. سابت کوڕی قوتنە وتی:

فدت نفسی فوارس من تمیم | غداة الروع فی ضنك المقام
فدت نفسی فوارس اکنفونی | علی الاعداء فی رهج القتام
بقصر الباهلی و قد راونی | احامی حین ضن بة المحامی
بسیفی بعد حطم الرمح قدما | اذودهم بذی شطب حسام
اکر علیهم الیحموم کرا | ککر الشرب انیة المدام
اکر لدی غمرات آلموت حتی | تجلت لا یضیق به مقامی
فلو لا الله لیس له شریك | و ضربی قونس الملك الهمام
اذا لسعت نساء بنی دثار | امام الترك بادیة الخدام
فمن مثل المسیب فی تمیم | ابی بشر کقادمة الحمام

یانی: گیانم بەقوربانی سوارە بەئەزمونەکانی تەمیم بێت کە لەبەرەبەیانی ئەو شەڕە مەترسیدارە، لەو تەنگانەیە، پیاوانە هەوڵیاندا. لەکۆشکی باهلی بون، منیان بینی کەپارێزگاری لەخەڵکەکەی،خۆم دەکەم چونکە لەم کاتەدا پاسەوانەکان لەشەڕ خۆیان بەدور دەگرت. دوای ئەوەی ڕمەکەم شکا، شمشێرم لەکاڵان دەرکێشا، شمشێرێکی تیژ. ئەسپە تیژپێکەی خۆم بۆ سەر ئەوان غار پێدەدا و بەردەوام ڕووم تێدەکردن بەهەمان

شێوە کە مەیخۆران بەردەوام پیاڵە بۆ یەك دەگێڕن. لەو کاتی گیان بەخشین، بەردەوام هێرشم دەبرد تا بای گۆڕەپان دامرکایەوە و لەتەنگانە رزگارم بو. ئەگەر خواوەندی بێ هاوتا وشمشێر وەشاندنی یەك لەدوای یەکی من لە ناوچاوی پاشای دورئەندێشی نەدەبوو، ژنانی بەنی دێسار لەبەرابەر تورکەکان دەکەوتنە سەرچۆك و لەحەسرەتا پشتی دەستیان بەدیان دەخوارد. لەناو تەمیمیەکان چ کەسێك وەك باوکی بوشر موسەییبە؟ ئەو کۆتری پێشەنگی شەڕکەرانە.

لەو شەوەدا یەکێك لەچاوەکانی معاویە کوڕی حەجاجی تایی کوێر و دەستی گۆج بو. ئەو لەلایەن سەعدەوە تا پلەی فەرمانداری بەرز کرایەوە. سەعد بۆ وەرگرتنەوەی قەرزێك کە لەئەستۆیدابو، ئەوی گرت و خستیە زیندان و دواتر تەسلیمی شەداد کوڕی خولەیدی باهلی کرد کە زێری لێ بستێنێت. شەداد تەنگی پێ هەڵچنی. معاویە وتی: ئەی خەڵکی قەیس، رۆشتمە کۆشکی باهلی و دەستێکی چالاك و چاوێکی تیژبینم بوو، چاوێکم کوێر و دەستێکم گۆج و لەگەڵ ئەوەیشدا پیاوانە شەڕم کرد و بنەماڵەکانی ئێوەم لەدەستی تورکەکان رزگار کرد لەکاتێدا هەمویان لەکوژران و ئەسیرکران نزیك ببونەوە. ئێستا سەروەرەکەتان ئەو کارەم لەگەڵ دەکات کە دەیبینن، لەبەرابەر ئەو بمپارێزن. شەداد دەستی لێ هەڵگرت. یەکێك لەو کەسانەی لەکۆشکدا بوو، وتی: کاتێك دو لای شەڕکەر، شەڕیان دەست پێکرد، لەزۆری دەنگی هاواری پیاوان و حیلەی ئەسپەکان و دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان گومانمان کرد رۆژی هەستانەوە دەستی پێکردوە.

## شەڕ لەگەڵ خەڵكانی سەغد

لەم ساڵەدا سەعید خوزەینە لەرووبار تێپەڕی و شەڕی لەگەڵ خەڵكانی سەغد كرد چونكە پەیمانەكەی خۆیان شكاند و لەبەرابەر موسوڵمانەكان هاوكاری توركەكانیان كرد. خەڵك بەسەعیدیان وت: تۆ شەڕ ناكەیت و توركەكان هێرشیان كردوە و خەڵكانی سەغد لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە. ئەو روباری بەمەبەستی روبەروبونەوە لەگەڵ سەغدیەكان بڕی. توركەكان و دەستەیەك لەخەڵكانی سەغد روبەروی بونەوە و موسوڵمانان ئەوانیان تێكشكاند. سەعید وتی: شوێنیان مەكەون چونكە سەغدیەكان بێستانی سەروەری باوەڕدارانن (چونكە ئەوان دەكاتە كرێكار و بەرهەمەكانیان وەك میوەیەكی شیرین دەخوات) ئێوە ئەوانتان تێكشكاند، ئایا دەتانەوێت لەناویان ببن؟ ئێوە ئەی خەڵكانی عێراق، چەندین جار لەگەڵ خەلیفە شەڕتان كردوە، ئایا ئێوەیان لەناو برد؟ سورە كوڕی حوڕ بەحەیانی نەبتی وت: شوێنیان مەكەوە ئەی حەیان. وتی: نێچیرێكی خواییە، وازی لێ ناهێنم. وتی: ئەی نەبتی، بگەڕێرەوە. وتی: خوار روخسارت نەبتی بكات.

موسوڵمانان پێشڕەویان كرد تا گەیشتنە دۆڵێك كە لەنێوان ئەوان و مێرگەلآنەكە جیایی دروست كردبو. دەستەیەك لەوان پەڕینەوە. توركەكان لەسەر رێگە دانیشتبون، كاتێك موسوڵمانان گەیشتن، هاتنەدەر وهێرشیان كردنە سەر. موسوڵمانان شكستیان خوارد و هەلآتن تا گەشتنە دۆڵەكە. لەوێ لەبەرابەر توركەكان خۆڕاگری و پاشەكشێیان پێكردن. دەستەیەك دەڵێن: بەم شێوە نەبو بەڵكو تێكشكاوەكان، شەڕكەرە پیادەكانی پادگانی موسوڵمانان بون. نەكەوتبونە خۆ كە لەناكاو بینیان توركەكان لەناو دارستانەكەوە هێرشیان كردنەسەر. سەرگردەی سوارەكان شوعبە كوڕی زوهەیر بو. توركەكان بەشێوەیەكی خێرا هەڵمەتیان برد كەموسوڵمانان نەیانتوانی سوار ئەسپەكانیان ببن. شوعبە شەڕی لەگەڵ ئەوان كرد و كوژرا و پەنجا كەسی دیكە لەگەڵ ئەودا كوژران، شەڕكەرانی ناو پادگانەكە شكستیان خوارد و موسوڵمانان لەم شكستە ئاگادار بونەوە. خەلیل كوڕی ئەوسی عەبشەمی (پیاوێك لەبەنی زاڵم) سوار لەسەرئەسپەكەی هاواری كرد: ئەی بەنی تەمیم، لەدەوری من كۆببنەوە، من خەلیلم!

دەستەیەك لەدەوری كۆبونەوە و بەهاوكاری ئەوان هێرشی كردە سەر دوژمن و زەویگیری كردن تا فەرماندە لەگەڵ شەڕكەرانی موسوڵمان گەیشت و دوژمن هەڵات. خەلیل بو بەسەركردەی سوارەكانی بەنی تەمیم تا نەصر كوڕی سەیار هاتە سەركار. دواتر فەرماندەیی ئەوان بە حەكەم كوڕی ئەوس گەیشت.

لەساڵی داهاتودا، پیاوانێكی لەتەمیم بۆ وەزغیش رەوانە كرد و وتیان: خۆزگە روبەروی دوژمن دەبوینەوە و شوێنیان دەكەوتین. هەرجار كەسەعید هێزە شەڕكەرەكانی رەوانە دەكرد و ئەوان سەركەوتنیان بەدەست دەهێنا و تاڵانی و ئەسیریان دەگرت، ئەسیرەكانی دەگەڕاندەوە و سزای شەڕكەرانی دەدا. هیجری شاعیر وتی:

سریت الی الاعداء تلهو بلعبة          و ایرك مسلول و سیفك مغمد

و انت لمن عادیت عرس خفیة          و انت علینا كالحسام المهند

یانی: روبەروی دوژمنان بویتەوە و گەمەت دەست پێكرد و لەم كاتەدا كێرت خەساو و شمشێرەكەت لەكالاَندا بوو. تۆ بۆ دوژمنان، بوكێكی ناو پەردە و بۆ ئێمە شمشێری هیندیت.

سەعید دەستی لەبەرێوبەردنی كارەكانی خەڵك هەڵگرت و خەڵك ئەویان بەسست و ناتەوان لەقەڵەمدا.

پیاوێك لە بەنی ئەسەد بەناوی ئیسماعیل بەردەوام لەگەڵ مەروان كوڕی محەممەد ژیانی بەسەر دەبرد. ئیسماعیل لای سەعید لەهاورێیەتی لەگەڵ مەروان قسەی كرد. سەعید وتی: ئەو بێ دایك و باوكە چ كارمیە! ئیسماعیل وتی:

زعمت خذینة اننی ملط          لخذینة المیرآة و المشط

و مجامر و مكاحل جعلت          و معازف و بخدها نقط

افذاك ام زعف مضاعفة          و مهند من شانه القط

لقرس ذكر اخی ثقة          لم یغذه التانیث و اللقط

یانی: خوزمینە گومانی كرد من بێ باوك و دایكم، خوزمینە شایانی ئاوێنە و شانەیە. ئیسپەندەر دەسوتێنێت، كل لەچاوانی دەكات، تار دەژەنێت و خاڵ لەروخساری دەكوتێت. ئەوە باشترە یا زرێیەكی چەند توێ، هەورێكە زۆر دەبارێت و هەرجار زیاتر دەبارێت، و شمشێری هیندی كە بەردەوام سەربرین پیشەیەتی. بۆ پیاوێكی ئەستور و

چوارشانە و شیاوی خۆشویستن کە شێوە ژنانەکان و بوختانەکان، گلاوی ناکەن.

ئەم قەسیدەیە چەندین دێری دیکەی هەیە.

## مەرگی حەیانی نەبتی

پێشتر سەبارەت بەحەیان کوڕی نەبتی قسەمان کرد و ئەمە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی قوتەیبە بوو کە چۆن کوژرا و دواتر حەیان بو بەسەروەر و لەپێشی پێبڕا و لەخوراسان ناو و ناوبانگی بۆ خۆی بەدەست هێنا. وتمان کە سورە کوڕی حوڕ پێی وت: ئەی نەبتی و حەیان وەڵامی دایەوە: خوا روخسارت نەبتی بکات (انبط الله وجهك) سورە لەمە ڕەنجا و بەسەعید کوڕی خوزەینەی وت: ئەم کۆیلەیە دوژمنترین دوژمنی عەرەبەکان و موالیەکانە و فەرماندار بەناحەز دەزانێت. ئەو بو خوراسانی لەدەست قوتەیبە دەرهێنا و ئێستا دەیەوێت دژی تۆ شۆڕش بکات و خوراسان لەدەستی تۆ دەربێنێت و دواتر لەیەکێك لەقەلاکان سەنگەر بگرێت. سەعید وتی: لای کەس باسی ئەم قسەیە مەکە. دواتر لەناو کۆڕەکەی خۆی داوای شیری کرد و فەرمانیدا کەمێك زێریان(نەك ژەهر)هێنا و لێیان سوو و تێکەڵ بەشیرەکەیان کرد و کردیانە ناو پیاڵەی شیرەکەی حەیان. دواتر سەعید و هاورێکانی تا چوارفەرسەخ ئەسپیان غاردا و گەڕانەوە. حەیان چوار ڕۆژ مایەوە و دواتر مرد. دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا نەمرد، لەگێڕانەوەی روداوی ساڵەکانی داهاتو بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

## لەسەر کار لابردنی مەسلەمە لەعێراق و خوراسان و دانانی کوڕی هوبەیرە

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کاتێك مەسلەمە بەفەرمانداری عێراق و خوراسان، جگە لەباج هیچی بۆ دەرباری خەلیفە رەوانە نەکرد. یەزید کوڕی عەبدولمەلیك شەرمی دەکرد ئەو لەسەر کار لاببات. نامەی بۆ نارد: کەسێك بکەرە جێگری خۆت و بۆ لای من بەرێکەوە.

دەستەیەك دەڵێن: مەسلەمە لەگەڵ عەبدولعەزیز کوڕی حاتەم کوڕی نوعمان سەبارەت بە ڕۆشتن بۆ لای یەزید راوێژی کرد. وتی: ئارەزومەندی دیداری ئەویت؟ کاتێکی زۆر نیە لای ئەو گەڕاویتەوە. وتی: بەناچاری دەبێت بڕۆم. وتی: کەواتە بزانە ناڕۆیت مەگەر ئەوەی چاوت بەفەرمانداری تازەی سەرزەمینەکەت بکەوێت. مەسلەمە بەرێکەوت و عومەر کوڕی هوبەیرەی فەزاری لەعێراق بینی کە سوار لەسەر ئەسپ و چوارپێکانی تایبەت بە نامە بردن بوو. مەسلەمە لەهۆکاری هاتنەکەی پرسی: عومەر وتی: سەروەری باوەڕداران رەوانەی کردوم تا سامانی بنەماڵەی موهەلیب وەربگرم.

کاتێك عومەر ئەوی بەجێهێشت، مەسلەمە، عەبدولعەزیز کوڕی حاتەمی بانگ کرد و لەوتەکانی کوڕی هوبەیرە ئاگاداری کردەوە. وتی: پێشتر تۆم ئاگادار کردەوە. مەسلەمە وتی: بەڵام ئەو بۆ وەرگرتنی سامانی بنەماڵەی موهەلیب هاتوە. عەبدولعەزیز وتی: ئەمە سەرسورهێنەرترە. کوڕی هوبەیرە فەرمانڕەوایی جەزیرە دەکات و لەکارەکەی دوردەخرێتەوە و بۆ وەرگرتنی سامانی بنەماڵەی موهەلیب بۆ ئەم دیارە دێت بێ ئەوەی نامەیەکی بۆ تۆ پێ بێت.! زۆری نەخایاند کە ئاگاداریان کردەوە کە کوڕی هوبەیرە کارگوزارەکانی ئەوی لەسەر کار لابردوە. فەرزدق وتی:

راحت بمسلمة البغال عشية    فارعى فزارة لا هناك المرتع

عزل ابن بشر و ابن عمر و قبله    و اخو هراة لمثلها يتوقع

یانی: دوێ شەو ئێسترەکان مەسلەمەیان برد، ئەی فەزاریەکان لێرەدا بلەوەڕێن کە هیوادارم نەبێتە لەوەرگەی شیاو بۆ ئێوە! کوڕی بشر و کوڕی عەمرۆ پێش ئەو لەسەر

کار لابران و پاشای هەرات چاوەڕوانی ئەم چارەنوسەی دەکرد.

مەبەستی لەکوڕی بشر عەبدولمەلیك کوڕی بشر کوڕی مەروان و لە کوڕی عەمرۆ محەممەد زونەلشامە و لەپاشای هەرات خوزمینە بو.

بەڵام سەرەتای کاری هوبەیرە تا گرتنەدەستی فەرمانڕەوایی هەمو عێراق بەم شێوە بوو کە ئەو لەقوڵایی بیابان لەنێوان بەنی فەزارەوە هات و لەگەڵ یەکێك لەفەرمانەدەکانی تایبەت بەکاروباری جەنگ پەیوەندی هاورێیەتی بەست، دەیوت: هیوادرام زۆر نەخایەنێت و ببمە فەرمانداری عێراق. لەگەڵ عەمرۆ کوڕی معاویە عەقیلی بۆ شەڕی رۆمیەکان ڕۆشت. ئەسپێکی رەسەن بەڵام سەرکێش و ناثارامیان بۆ هێنا. وتی: هەر کەسێك بتوانێت سواری بێت، ئەسپەکە بۆ خۆی. عومەر کوڕی هوبەیرە هەستا و لەدورەوە بەدەوری ئەسپەکەدا سوڕا و کاتێك گەشتە شوێنێك کەنەگەر ئەسپەکە جووتەی دەخست، قاچەکانی پێی دەگەیشت، خۆی هەڵدا و پەڕیە سەر زینی ئەسپەکە. ئەسپەکەی تایبەت کرد بەخۆی.

کاتێك موتەریف کوڕی موغەیرە کوڕی شوعبە نافەرمانی فەرمانەکانی حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی کرد و ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد، عومەر کوڕی هوبەیرە لەناو ئەو سوپایەدا بو کە بۆ شەڕی ئەو بەرەو ڕەی بەرێکەوتن. کاتێك دوسوپا شەڕیان دەکرد کوڕی هوبەیرە پەیوەستی موتەریف بو و وای نیشاندا کەچیتر لەبەرژەوەندی ئەو شەڕ دەکات. کاتێك شەڕ رووی لەدژواری کرد، کوڕی هوبەیرە لەو کەسانە بو کەموتەریفیان کوشت و سەریان بڕی. دەستەیەك دەڵێن: کەسێکی دیکە ئەوی کوشت و عومەر کوڕی هوبەیرە سەری بڕی و بردیە لای عودەی و پاداشتی وەرگرت. عودەی ئەوی لەگەڵ سەری موتەریف بۆ لای حەجاج رەوانە کرد و حەجاجیش بۆ دەرباری عەبدولمەلیك کوڕی مەروان. عەبدولمەلیك گوندی بەرزەی (لەگوندەکانی دیمەشق) پێ بەخشی. کوڕی هوبەیرە بۆ لای حەجاج گەڕایەوە کەئەوی بۆ لای کەردەم کوڕی مێرسەدی فەزاری رەوانە کرد کە سامانەکانی بەزۆر لەدەست دەرهێنا. عومەر کوڕی هوبەیرە سامانەکەی هەڵگرت و فڕاندی و بۆ لای عەبدولمەلیك کوڕی مەروان هەڵات و وتی: لەترسی حەجاج، پەنا بۆ سەروەری باوەڕداران دەبەم چونکە کوڕە مامی ئەو موتەریف کوڕی موغەیرەم کوشت و سەریم هێنایە لای سەروەری باوەڕداران و دواتر بۆ لای حەجاج گەڕامەوە کە

مەبەستی کوشتنی منی کرد، ئێستا دڵنیام من بەکارێکەوە سەرقاڵ دەکات کە ببێتە هۆکاری لەناوچونم. عەبدولمەلیك پێی وت: تۆ لەپەنای مندایت. لای عەبدولمەلیك مایەوە. حەجاج نامەی بۆ عەبدولمەلیك نوسی کە ئەو سامانەکانی فڕاندوە و هەڵاتوە. عەبدولمەلیك وتی: دەست لەو هەڵبگرە.

یەکێك لەکوڕەکانی عەبدولمەلیك کچی حەجاجی کردە هاوسەری خۆی و کوڕی هوبەیرە چەندین دیاری گرانبایی بۆ ئەو ژنە کڕی و چاکەی زۆری لەگەڵدا کرد. کچ نامەی بۆ باوکی نوسی و فەرمانی پێدا کاروبارەکانی بۆ ڕێکبخات و نیازەکانی بەراوەردە بکات. پێگەی ئەو لەشام بەرزبویەوە. کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتەسەرکار، ئەوی وەك فەرمانداری جەزیرە دەستینشان کرد. کاتێك یەزید کوڕی عەبدولمەلیك هاتەسەرکار و هوبەیرە بینی ئەو کەنیزە مانگ ڕوخسارە فەرمانڕەوایەتی دڵ و گیانی خەلیفە دەکات، دەستی بەناردنی دیارییە گرانباییەکان بۆ ئەو ژنە و بۆ خەلیفە کرد. ژن، خەلیفەی ناچار کرد ئەو وەك فەرمانڕەوایی سەراسەری عێراق دەستنیشان بکات. یەزید کوڕی عەبدولمەلیك مەبەست و خواستی ئەو ژنەی هێنایەدی و کوڕی هوبەیرەی وەك فەرمانڕەوایی عێراق دەستنیشان کرد.

کوڕی هوبەیرە لەگەڵ قەعقاع کوڕی خولەید ڕژدیان بەیەك دەبرد. قەعقاع دەیوت: کێ دەتوانێت لەبەرابەر کوڕی هوبەیرە خۆڕاگری بکات، حەبابە شەوانە لەبەرژەوەندی ئەو هەوڵ دەدات و کوڕی هوبەیرە ڕۆژانە دیارییەکانی بۆ ڕەوانە دەکات! کاتێك حەبابە مرد و دڵی خەلیفەی سوتاند، قەعقاع وتی:

| | |
|---|---|
| هلم فقد ماتت حبابة سامنی | بنفسك يقدمك الذری و الكواهل |
| اغرك ان كانت حبابة مرة | تميحك فانظر كيف ما انت فاعل |

یانی: ها، هەنگاو بێنە پێش و لەگەڵ من بەرابەری بکە چونکە حەبابەی جوان ڕوخسار مرد، خۆت وەرە پێش تا ببینیت ئێمە لەتۆ لەپێشتر و گەورەترین. ئەم کارە تۆی فریودا کە ڕۆژێك لەڕۆژەکان حەبابە لەبەرژەوەندی تۆ قسەی بۆ خەلیفە کرد، ئێستا بزانە خۆت دەتوانی چی بکەیت.

ئەم قەسیدەیە چەندین دێری هەیە.

ڕۆژێك لەنێوان ئەو قەعقاع شەڕە قسە ڕوویدا و قەعقاع پێی وت: ئەی زادەی ژنی

بۆگەن، چ کەسێك لەپێشی پێ بەخشی؟ کوڕی هوبەیرە وتی: قونی ژنە جوان روخسارەکان لەپێشی بەتۆ بەخشی و من بەهۆی سینە دەرپەڕاوەکانی ڕمە سەرفرازەکان لەپێشیم پێبڕا. مەبەستی ئەوە بو کە عەبدولەلیك پەیوەندی هاوسەرگیری لەگەڵ بنەماڵەی قەعقاع بەست چونکە دایکی وەلید کوڕی عەبدولەلیك و سلێمان کوڕی عەبدولەلیك لەژنانی عەبسی بو.

## بەشێك لەبانگەوازی عەباسیەکان

لەم ساڵەدا مەیسەرە نێردراوەکانی خۆی لەعێراقەوە رەوانەی خوراسان کرد و کاری بانگەشەکەران لەوێ ئاشکرا بوو. عەمرۆ کوڕی بەحیر کوڕی وەرقای سەعدی ڕۆشتە لای سەعید کوڕی خوزەینە و پێی وت: کەسانێك لێرەن کەوتەی ناشیرین دەهێننە سەرزمان. چۆنیەتی روداوەکانی بۆ باس کرد. سەعید چەندین کەسی رەوانە کرد کەئەوانی هێنا و پرسی: کێن؟ وتیان: دەستەیەك لەبازرگانەکان. وتی: ئەم باس و خواسە چیە لەناو خەڵکان بلاّوتان کردۆتەوە؟ وتیان: نازانین. وتی: هاوشێوەی بانگەشەکەرەکان هاتون؟ وتیان: بەشێوەیەك گرفتاری کارەکانی خۆمانین ناتوانین سەرقاڵی ئەو کارانە بین. وتی: چ کەسێك ئەوان دەناسێت؟ دەستەیەك لەخوراسانیەکان (زۆربەیان لەیەمانیەکان و رەبیعە) هاتن و وتیان: ئەوان دەناسین، ئەگەر هەواڵێکی ناخۆش لەوان بەگوێی تۆ بگات، گوناحەکەی لەئەستۆی ئێمەدا بێت. ئەوانی ئازاد کرد.

## کوژرانی یەزید کوڕی ئەبی موسلیم

دەڵێن: یەزید کوڕی عەبدولەلیك لەساڵی ١٠١/٧١٩-٧٢٠ زایینی یەزید کوڕی ئەبی موسلیمی کردە فەرمانداری ئەفریقیە. دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا بوو. هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بو کەمەبەستی ئەوەی کرد لەناو ئەوان بەشێوەی حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی سەبارەت بەو موسوڵمانانە هەڵس و کەوت بکات کە نیشتەجێی شارەکان و لەبنەڕەتدا خەڵکی سوادی عێراق و لەعێراق باوەڕیان بەئیسلام هێنابو. ئەوانی بۆ گوندەکانی خۆیان گەڕاندەوە و باجی لەسەر دانان و ئەوەی لێوەرگرتن کە لەکاتی بتپەرەستی لەوان وەردەگیرا. کاتێك یەزید مەبەستی ئەم کارەی کرد، ئەفریقیەکان بۆ کوشتنی ئەو یەکیانگرت و کوشتیان و کەسێکیان کردە فەرمانداری خۆیان کە پێش یەزید کوڕی ئەبی موسلیم فەرمانڕەوایەتی دەکرد کەمحەممەد کوڕی یەزید بو. ئەو شارەکانی خستە ژێر فەرمانی خۆی و لای ئەوان مایەوە. نامەیان بۆ یەزید کوڕی عەبدولەلیك نوسی: ئێمە سەرپێچی فەرمانەکانی ئێوە ناکەین بەڵکو بەم شێوە بو کە یەزید کوڕی ئەبی موسلیم ئەو بەلای بەسەردا هێناین کە خوا و موسوڵمانەکان پێی رازی نەبون و لەبەر ئەمە ئەومان کوشت و کارگوزارەکەی تۆمان گەڕاندەوە بۆ سەر کارەکەی. یەزید لەوەلامدا نوسی: من لەکاری یەزید کوڕی ئەبی موسلیم رازی نەبوم. ئەو فەرمانداری محەممەد کوڕی یەزیدی بەهێز و پشت راست کردەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی هوبەیرە لەپانتاییەکانی ئەرمەنستان شەڕی لەگەڵ ڕۆمیەکان کرد چونکە پێش گرتنەدەستی فەرمانڕەوایەتی عێراق فەرمانڕەوایەتی جەزیرەی دەکرد. ئەوانی شکستدا و دەستەیەکی زۆری لەوان ئەسیر کرد کەبەوتەی دەستەیەك ژمارەیان دەگەیشتە حەوتسەد کەس. هەروەها لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك شەڕی لەگەڵ ڕۆمیەکان کرد و دەستی بەسەر دلسەدا گرت.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك (فەرمانداری مەدینە) ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا.

فەرمانداری مەککە عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید، فەرمانداری کوفە محەممەد کوڕی عەمرۆ زونەلشامە، فەرمانداری بەسرە عەبدولمەلیك کوڕی بشر کوڕی مەروان بو تا ئەوەی عومەر کوڕی هوبەیرە ئەوی لەسەر کار لابرد، فەرمانداری خوراسان سەعید خوزەینە، فەرمانداری میسر ئوسامە کوڕی زەید، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە قاسم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللە کوڕی مەسعود بو.

## رووداوەکانی ساڵی سەد و سێیەمی کۆچی ( ٧٢١-٧٢٢ زایینی )

## دەست نیشان کردنی سەعیدی حەرەشی لەخوراسان

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی هوبەیرە، سەعید خوزەینەی لەفەرمانداری خوراسان دورخستەوە. هۆکاری لەسەرکار لابردنەکەی ئەوە بو کە موجەشەر کوڕی موزاحیمی سولەمی و عەبدالله کوڕی عومەیری لەیسی ڕۆشتنەی لای کوڕی هوبەیرە و سکالآیان لەسەعید خوزەینە کرد. ئەو سەعید خوزەینەی لەسەر کارەکەی لابرد و لەجێگەکەی سەعید کوڕی عەمرۆ حەرەشی دانا. خوزەینە لەدەروازەی سەمەرقەند سەرقاڵی شەڕ کردن بو کە هەواڵی لەکاردەرکرانی پێگەیشت و ئەو هەزار پیاوی شەڕکەری لەو گۆڕەپانەدا بەجێهێشت.

## درێژەی رووداوەکان

دەستەیەك دەڵێن: عومەر کوڕی هوبەیرە نامەیەکی بۆ یەزید کوڕی عەبدولەلیك نوسی و ئاماژەی بەناوی کەسانێکدا کە لەشەڕی (عەقر) پیاوانە تێکۆشاون، ئاماژەی بەناوی سەعیدی حەرەشی نەکرد. یەزید وتی: بۆ ناوی حەرەشی نەبردوە؟ نامەی بۆ عومەر کوڕی هوبەیرە نوسی: حەرەشی بکەرە فەرمانداری خوراسان. کوڕی هوبەیرە بۆ ئەو کارە دەستنیشانی کرد. ئەو پێش خۆی موجەشەر کوڕی موزاحمی سولەمی ڕەوانە کرد و نەهار کوڕی تەوسیعە وتی:

| | |
|---|---|
| فهل من مبلغ فتيان قومي | بان النبل ريشت كل ريش |
| و ان الله ابدل من سعيد | سعيدا لا المخنث من قريش |

یانی: ئایا کەسێك هەیە جوامێرەکانی بنەماڵەکەم ئاگادار بکاتەوە کەنوکی تیرەکان بەشێوەیەکی باشتر ئامادە کران و خواوەند لەجیاتی سەعید خوزەینە، سەعیدی حەرەشی هێنایە سەرکار نەك ئەو پیاوە حیزە قون دڕاوە قورەیشیە.

سەعیدی حەرەشی هاتە خوراسان و کارگوزارەکانی سەعیدی خوزەینەی لەسەر کار لانەبرد. پیاوێك فەرمانی ئەوی خوێندەوە و بەهەڵە خوێندییەوە. وتی: بێدەنگ بە، ئەوەی بیستتان، هەڵەی دەبیرە و سەروەری لێی بێ بەرییە. کاتێك حەرەشی گەیشتە

خوراسان، خەڵك لەبەرابەر دوژمنان شەڕیان دەكرد. ئەوان سەركوت كرابون. وتارێكی پێشكەش كردن وبۆ شەڕ هانیدان و وتی: ئێوە بەم ژمارە زۆر و كەرەستە فراوانانە شەڕ ناكەن بەڵكو بەهاوكاری پەروەردگار و ئایینی پێغەمبەری) ڕێزدار، بڵێن: هیچ توانا و توێشوێك نیە مەگەر لەلایەن خواوەندی گەورە وڕێزدار، وتی:

فلست لعامر ان لم ترونی امام الخیل اطعن بالعوالی
و اضرب هامة الجبار منهم بعضب الحد حودث بالصقال
فما انا فی الحروب بمستكین و لا اخشی مصاولة الرجال
ابی لی والدی من كل دم و خالی فی الحوادث غیر خال

یانی: لەخەڵكی عامر نەبم ئەگەر نەمبینن لەبەرابەر سوارەكان بەڕمە گیان ستێنەكان شەڕ دەكەم. سەر یاخیەكانی ئەوان بەفیرۆ دەدەم و بەشمشێری تیژ لەناویان دەبەم كە بەسوان و ئاودان، تازەیان كردۆتەوە. لەشەڕدا ناتەوان نیم و لەروبەروبونەوە لەگەڵ شەڕكەران ناترسم. باوكم پەسەندی نەدەكرد دەست بۆ كاری سەركۆنەكراو درێژ بكەم و نەژادم بۆ روبەروبونەوە لەگەڵ روداو وپێشهاتەكان، پشتیوانی منە.

كاتێك خەڵكانی سەغد بیستیان حەرەشی هاتۆتە خوراسان، لەخۆیان ترسان چونكە لەسەردەمی سەعید كوڕی خوزەینە هاوكاری توركەكانیان كردبوو. گەورەكانی ئەوان كۆبونەوە و بۆ هاتنەدەرەوە لەوڵاتەكەیان ڕێككەوتن. پاشاكەیان بەوانی وت: ئەم كارە مەكەن، بمێننەوە و هاوشێوەی پێشو باج بدەن و بۆ دانی خەراجی داهاتو پەیمانیان پێ بدەن، بەڵێنی پێ بدەن كەشارەكە ئاوەدان دەكەنەوە و ئەگەر شەڕ بكات، هاوكاری دەكەن. بۆ هاوكاری كردنی توركەكان، داوای لێخۆشبون و چەندین كەسی وەك بارمتە تەسلیم بكەن. وتیان: دەترسین، رازی نەبێت، ئێمە دەڕۆینە خەجندە و لەپاشاكەی داوای پەنابەریەتی و كەسێك بۆ لای فەرماندار رەوانە و داوای لێدەكەین لەكارەكانی رابردومان خۆش ببێت و بەڵێنی پێ دەدەین لەداهاتودا هیچ كارێكی نەشیاو لەئێمە نەبینێت. وتی: كەسێكم لەئێوە، بەڵام بۆچونەكەی من باشترە.

رازی نەبون و بەرەو خەجندە بەرێكەوتن و كەسیان بۆ لای پاشای فەرغانە رەوانە و داوایان كرد پارێزگاریان لێ بكات و لەشارەكەی خۆی جێگەیان بكاتەوە. ویستی بەداواكەیان رازی بێت، بەڵام دایكی پێی وت: نابێت ئەم شەیتانانە بێنە شارەكەی تۆ،

گوندێکیان بۆ دەستنیشان بکە تا لەوێ نیشتەجێ ببن. پەیامی بۆ ئەوان نارد: گوندێك دیاری بکەن تا لەوێ نیشتەجێ ببن و من دانیشتوانەکەی رابگوێزم، بۆ ئەم کارە چل یا (بیست) رۆژ دەرفەتم پێبدەن. ئەوان دۆڵی عیصام کوڕی عەبداللە کوڕی باهلییان هەڵبژارد کە قوتەیبە لەناو ئەواندا بەجێی هێشتبو. پاشا رازی بوو و وتی: ئێوە هیچ پەیمانێکتان لەملی مندا نیە و ئەگەر پێش رۆشتنە ناو ئەو دۆڵە عەرەبەکان هێرش بکەنە سەرتان، پارێزگاریتان لێ ناکەم. رازی بون و پاشا دۆڵەکەی بۆ چۆڵ کردن.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا تورکەکان هێرشیان کردە سەر لان.

هەروەها لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید لەگەڵ رۆمیەکان شەڕی کرد و شارێك بەناوی دلسەی گرت.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك بو بەفەرمانداری هەردو شاری مەککە و مەدینە.

لەم ساڵەدا عەبدولواحید کوڕی عەبداللە نەزری بوو بەفەرمانداری تاییف و عەبدولعەزیز کوڕی عەبداللە کوڕی خالید لەفەرمانداری ئەم شارە و شاری مەککە لابرا.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك، فەرمانداری مەککە و مەدینە ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. فەرمانڕەوایی عێراق عومەر کوڕی هوبەیرە و فەرمانڕەوای خوراسان سەعید حەرەشی بو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە قاسم کوڕی عەبدولرەحمان و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە عەبدولەلیك کوڕی یەعلی.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: شەعبی لەتەمەنی ٧٧ ساڵی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٢٢/١٠٤ زایینی یا ساڵی ١٠٥/ ٧٢٣ زایینی یا ساڵی ١٠٧/ ٧٢٥ زایینی مرد، یەزید کوڕی ئەصەم خوشکەزای مەیمونە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٠٤/ ٧٢٢ زایینی مرد و ساڵەکانی تەمەنی ٧٣ساڵ درێژەی کێشا. ئەبو بوردە کوڕی ئەبی موسا ئەشعەری، یەزید کوڕی حوصەین کوڕی نومەیری سەکونی، عەتا ء کوڕی یەسار برای سلێمان کوڕی یەسار، عومرە کچی عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کوڕی زورارەی ئەنساری لە تەمەنی ٧٧ ساڵی، موصعەب کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص،

یەحیا کوڕی وەسابی ئەسەدی مێنقەری، عەبدولعەزیز کوڕی حاتەم کوڕی نوعمانی باهلی کارگوزاری عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەجەزیرە.

ڕوداوەکانی ساڵی سەد و چواری کۆچی

(٧٢٢ - ٧٢٣ زایینی)

شەڕی نێوان سەعیدی حەرەشی و خەڵکانی سەغد

دەڵێن: لەم ساڵەدا سەعیدی حەرەشی بەمەبەستی شەڕ لەرووبار پەڕیەوە و بەرێکەوت و لەکۆشکی (ریح) لەدو فەرسەخی دەبوسیە دابەزی بەڵام سوپاییەکان لەدەوری ئەو کۆنەبونەوە و لەبەر ئەمە لەوێ کۆچی کرد. هیلال کوڕی عولەیمی حەنزەلی پێی وت: ئەی پیاو، ئەگەر وەزیر بیت باشترە لەوەی ئەمیر بیت، سوپاییەکان لەدەوری تۆ کۆنەبونەوە و مەبەستی ڕۆشتنت کرد. گەڕایەوە و فەرمانیدا دابەزن. کوڕە مامی پاشای فەرغانە هاتە لای و وتی: خەڵکانی سەغد لەخەجندەن، هەواڵی ئەوانی بەسەعید گەیاند. زیادی کرد: پەلە بکە و پێش ئەوەی بگەنە دۆڵەکە، خۆت بگەیەنە چونکە تا نەگەنە ناو دۆڵەکە ئێمە پارێزگاریان لێ ناکەین. ئەو عەبدولرەحمانی قوشیری و زیاد کوڕی عەبدولرەحمانی هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك ڕەوانە کرد و دوای ئەوەی بەرێکەوتن، لەکارەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و وتی: پیاوێکی مل ئەستور هاتە لای من کەنەمزانی ڕاست دەکات یا درۆ، سوپایی موسوڵمانانم بەپێی قسەکانی ئەو ڕوبەڕوی زیان کردەوە. بەدوای ئەواندا بەرێکەوت و لەئەشروسنە دابەزی و لەسەر بنەمای پێدانی بڕێك پارە ئاشتی لەگەڵ کردن.

لەو کاتەدا کە سەرقاڵی خواردنی نانی ئێوارێ بون، کوڕی عەتای دەبوسی کە هاورێ لەگەڵ عەبدولرەحمان بوو، هاتە لای، پاروەکە لەدەستی کەوت، عەتای بانگ کرد و وتی: هاوار لەتۆ، لەگەڵ کەس شەڕتان کرد؟ وتی: نە. ئاگاداری کردەوە کەبۆ چ مەبەستێك هاتوە. ئەو بەپەلە بەرێکەوت و دوای سێ ڕۆژ غاردان بە عەبدولرەحمانی قوشیری گەیشت و لەوێوە بەرێکەوت تا گەشتە خەجندە و لێرە یەکێك لەهاوەڵانی پێی وت: چی دەبینی؟ وتی: شەڕ. وتی: من ئەمە پەسەند ناکەم، ئەگەر پیاوێك بریندار بێت، بۆ کوێ بڕوات و ئەگەر کەسێك کوژرا، بۆ کوێی ببەین؟ بۆچونم وایە دەبێت دابەزین و چاوەڕوان بین و خۆمان بۆ شەڕ ئامادە بکەین. دابەزی و سەرقاڵی ئامادە کردنی خۆی و

سوپاکەی بو. کەس لەدوژمن روبەرویان نەبویەوە. خەڵك سەعیدی حەرەشیان بەترسنۆك لەقەڵەمدا و وتیان: پێشتر بۆ ئازایەتی و دینداری بەناوبانگ بوو بەڵام کاتێك هاتە خوراسان، بو بەپیاوێکی نەزان و گێژ. پیاوێك لەعەرەبەکان هەڵمەتی برد و بەگورز لەدەرگای خەجەندەی دا و شکاندی. ئەوان لەناو تویلەی مەڕ و بزنەکان لەپشت درگایی ناوەوە چاڵێکی قووڵ و گەورەیان هەڵکەند تا بەم شێوەیە موسوڵمانان فریو بدەن. دەیانویست ئەگەر شکستیان خوارد، بەرێگایەکدا بڕۆن کە خۆیان شارەزان و بەم شێوە موسوڵمانان گومڕا بکەن تا دەکەونە ناو چاڵەکە. لەگەڵ ئەوان شەڕیان کرد و شکستیان خواد و هەڵاتن. رێگەی خۆیان ون کرد و کەوتنە ئەو چاڵەی بەدەستی خۆیان هەڵیانکەندبو. موسوڵمانان چل پیاویان لەوان هێنایە دەر. حەرەشی گەمارۆی خستە سەریان و بەردهاوێژەکانی جێگیر کرد. ئەوان کەسیان بۆ لای پاشای فەرغانە رەوانە کرد و وتیان: خیانەتت لەئێمە کرد. داوایان کرد تا هاوکاریان بکات. وتی: پێش گەشتن بەدۆڵەکە هێرشیان کردە سەر ئێوە و ئێوە لەپەنایی مندا نین. سەغدیەکان خوازیاری ئاشتی و ئەمان بون و وتیان دەبێت ئەوان بۆ سەغد بگەرێنێتەوە، بەڵێنیاندا کە ژنان و منالآنی عەرەب تەسلیم بکەنەوە ونەوەی لەخەراج کەمیان کردۆتەوە، بیگەرێننەوە، هێرش نەکەنە سەر هیچ کەسێك و کەس لەوان لەخەجندە نەمێنێتەوە و ئەگەر کارێکی نەشیاویان کرد، خوێنیان رەوا بێت.

پاشاکان و بازرگانەکانی سەغد تەسلمیان بون و دەستبەرداری خەڵکی خەجندە بون. گەورەکانی سەغد تەسلیمی ئەو شەرکەرانە بون کەئەوانیان دەناسی. (کارزەنگ) خۆی تەسلیمی ئەیوب کوڕی ئەبی حسان کرد. حەرەشیان ئاگادار کردەوە کە خەڵکانی سەغد ژنێکی ئەسیری عەرەبیان کوشتوە. وتی: بەمنیان وتوە کە سابت ژنێکی کوشتوە و بەخاکی سپاردوە. رازی نەبو. پرسی و زانی کە هەواڵەکە راستە. سابتی بردە ناو خێوەتەکەی خۆی و کوشتی. کاتێك کارزەنگ لەکوشتنی ئەو ئاگادار بویەوە، ترسا و کەسی بۆ لای برازاکەی نارد و داوای پانتۆڵی کرد. بەکوڕی براکەی وتبوو: ئەگەر داوای پانتۆڵم کرد، بزانە کەچارەنوسم کوژرانە. پانتۆڵیان بۆ هێنا کەهاتەدەر و شەڕی لەگەڵ خەڵکان کرد و دەستەیەکی کوشت و سوپاکە شڵەژا و خەڵك زیانیان بەرکەوت. ئەو گەیشتە سابت کوڕی عوسمان کوڕی مەسعود کە هێرشی کردەسەر و خوێنی ڕشت.

کاتێك كارزەنگیان كوشت، سەغدیەكان سەد و پەنجا ئەسیری موسوڵمانیان كوشت. حەرەشیان لەم كارە ئاگادار كردەوە. پرسیاری كرد و زانی كەهەواڵەكە راستە. فەرمانی كوشتاری ئەوان و جیاكردنەوەی بازرگانانی دەركرد. سەغدیەكان لەبەر ئەوەی كەل و پەلی شەڕیان پێ نەبو، بەدار لەبەرابەر عەرەبەكان بەرگریان كرد و تا دوایین كەس كوژران. ئەوان سێ هەزار یا حەوت هەزار كەس بون. ئەو ژن و منداڵ و سامانی خەڵكانی سەغدی وەك تالآنی هەڵگرت و هەر شتێك لای دڵگیر و پەسەند بو، دەستی بەسەرداگرت. دواتر موسلیم كوڕی بودەیلی عەدەوی بانگ كرد و وتی: كاری دابەش كردنی تالآنیەكانم بۆ تۆ سپارد. وتی: دوای ئەوەی سەراسەری شەو كارگوزارەكانت لێیان دەدزی. كەسێكی دیكە بۆ ئەو كارە راسپێرە! كارەكەی بەكەسێكی دیكە سپارد. حەرەشی نامەی خۆی بۆ یەزید كوڕی عەبدولەلیك نوسی و لەنوسینی نامە بۆ عومەر كوڕی هوبەیرە خۆی بەدور گرت. ئەمە لەو كارانە بو دڵی عومەری رەنجاند. سابت كوڕی قوتنە سەبارەت بەتالآنیە دەستكەوتوەكان وتی:

اقر العين مصرع كارزنج و كشكير و ما لاقى يباد

و ديوشتى و مالا فى خلنج بحصن خجند اذ دمروا قبادوا

یانی: ئەوەی بوە هۆی روناكی چاوان، لەخاك و خوێن گەوزانی كارزەنگ و كەشكیر و یوباد و دیوشتی و خلەنگ بو كەهەمویان لەخەجەند گرفتار و لەناوچون.

دەڵێن: دیوشتی دێداری سەمەرقەند بو كە بەدیوناشەنگ ناو دەبرا كە لەعەرەبیدا ناوەكەیان بۆ دیونەشنج گۆڕیوە. هەروەها دەڵێن: عێلبا عكوڕی ئەحمەری یەشكرییان بۆ گرتن و دابەش كردن و كۆكردنەوەی تالآنیەكان راسپاردبو. پیاوێك سكەیەكی وردی بەدو درەم كڕی و زێڕی تیا بینی. گەڕایەوە و دەستی خستە سەر روخساری و وای نیشاندا كە چاوی ئازاری هەیە. سكەكەی گەڕاندەوە و دو درەمەكەی خۆی وەرگرتەوە. بەدوایدا گەڕان بەڵآم نەیاندۆزیەوە.

حەرەشی، سلێمان كوڕی ئەبی ئەلسەری بۆ قەڵآیەك بانگ كرد كەدۆڵی خەڵكانی سەغد چواردەوری گرتبو جگە لەیەك لای. خورامزم شا و پاشای (ئاخرون) و شومان لەگەڵ ئەودا بون. سلێمان فەرماندەی پێشەنگەكانی بەموسەییب كوڕی بشری ریاحی سپارد. لەیەك فەرسەخی روبەروی بونەوە و بۆ شەڕ ریزیان بەست. ئەوانی شكستدا و

بۆ ناو قەلاَّکە پاشەکشێی پێ کردن و لەوێ شەڕ دوبارە هەڵگیرسا. دیوشتی داوای کرد تەسلیمی فەرمانەکانی حەرەشی بێت. سلێمان ئەوی بۆ لای حەرەشی رەوانە کرد و حەرەشی رێزی لێگرت. دانیشتوانی قەلاَّکە خوازیاری ئاشتی بون لەسەر ئەو بنەمایی زیان بەژن و منالەکانیان نەگات تا ئەوان قەلاَّکە تەسلیمی عەرەبەکان بکەن. سلێمان کەسی بۆ لای حەرەشی رەوانە کرد تا چەندین کەس بۆ وەرگرتنی زێر و زیو و سامانەکانی ناو قەلاَّکە رەوانە بکات. ئەو کەسەکانی رەوانە کرد کە تالاَّنیەکانیان کۆکردەوە و فرۆشتیان و لەناو سوپاکەدا دابەشیان کرد.

حەرەشی سوپاکەی بەرەو کێش برد و خەڵکەکەی لەسەر بنەمای پێدانی دەهەزار یا شەش هەزار سەر (مەڕومالاَّت) ئاشتیان لەگەڵ کرد. دواتر بەرەو زرەنگ بەرێکەوت و لەوێ نامەی کوڕی هوبەیرەی پێگەیشت کە فەرمانی ئازاد کردنی دیوشتی پێدەدا. حەرەشی ئەوی کوشت و لەداریدا و نەسر کوڕی سەیاری بۆ وەرگرتنی پەیمانی ئاشتی لەخەڵکی کێش راسپارد. سلێمان کوڕی ئەبی سەری کردە فەرمانداری کێش و نەسەف. قەلاَّکانی زۆر بەهێز بون کەگرتنیان دژوار دەهاتە بەرچاو. موجەشەر بەحەرەشی وت: دەتەوێت کەسێکت پێ بناسێنم بێ شەڕ کردن دەستی بەسەردا بگرێت؟ وتی: بەڵێ. وتی: موسەربەل کوڕی خێریت کوڕی راشدی ناجی. حەرەشی ئەوی رەوانە کرد. ئەو هاورێی پاشاکەی بو کە بەسوبوغرەی ناودەبرا. موسەربەل پاشای ئاگادار کردەوە کەحەرەشی چ بەلاَّیەکی بەسەر خەڵکی خەجندە هێناوە، ئەوی ترساند. پاشا وتی: دەبێت چی بکەم؟ وتی: دەبێت بەئەمان رازی ببیت. پاشا وتی: چی لەو کەسانە بکەم کە پەیوەستی من بون؟ وتی: داوای ئەمانیش بۆ ئەوان بکە. پاشا رێگەی ئاشتی گرتەبەر کەئەمانیان پێ بەخشی و ولاَّتەکەیان پاراست و حەرەشی هاورێ لەگەڵ سوبوغرەی بۆ سەرزەمینەکەی خۆی گەڕایەوە و سوبوغرەی کوشت و لەداری دا (لەکاتێکدا ئەمانی پێ بەخشرابو).

## سەرکەوتنی خەزەرییەکان بەسەر موسوڵمانان

لەم ساڵەدا سوپایەك لەموسوڵمانان بەسەرکردایەتی سوبەیتی نەهرانی لەئەرمەنستانەوە بەرەو سەرزەمینەکانی خەزەر بەرێکەوت. خەزەرییەکان لەدەستەیەکی فراوان کۆببونەوە و قەفچاق و کەسانیتر و هەمو تورکەکان هاوکاریان کردن. لەشوێنێك بەناوی (دارستانی بەرد) روبەرووی موسوڵمانان بونەوە و شەڕێکی پیاوانەیان کرد. دەستەیەکی فراوان لەموسوڵمانان کوژران و خەزەرییەکان دەستیان بەسەر لەشکرگەکەی ئەواندا گرت و هەمو سامانەکەیان وەك تالآنی هەڵگرت. شکست خواردوەکان بۆ شام گەڕانەوە و سوبەیت وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، نە ترسەنۆك بوم، نە پشتم لەشەڕ کرد، نە لاوازیم لەخۆم نیشاندا و نە لەبەرابەر دوژمن پاشەکشێم کرد. بەرادەیەك شەڕەکە دژوار بو کە پیاو لەئامێزی کەسێکیتر و ئەسپ سینەی بەسینەی ئەسپێکی دیکەوە بو. ئەوەندە ڕمم وەشاند کەڕمەکەم شکا و ئەوەندە شمشێرم بەکار برد کەتیغەکەی بو بەدوکەرت، جگە لەوەی کەخوای گەورە ئەو کارە ئەنجام دەدات-کەخۆی دەخوازێت.

## فەرمانداری جەراح کوڕی عەبدالله لەئەرمەنستان و دەست بەسەردا گرتنی بەلەنجەر و شارەکانیتر

کاتێك موسوڵمانەکان بەشێوەیەکی دیار و بەرچاو شکستیان خوارد، خەزەرەکان چاوی تەماحیان بڕییە سەرزەمینە ئیسلامیەکان و هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە. لەم کاتەدا یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، جەراح کوڕی عەبدالله حەکەمی وەك فەرمانداری ئەرمەنستان دەستنیشان کرد و سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی ئەو بۆ شەڕی خەزەرییەکان و سەرکوت کردنی دوژمنان و پێشڕەوی کردن لەقوڵایی سەرزەمینەکانی ئەوان رەوانە کرد. جەراح بەرێکەوت و خەڵکانی خەزەر ئەم هەواڵەیان لەیەك بیست و گەڕانەوە و لە باب و ئەبواب دابەزین. جەراح گەیشتە شاری بەرزەعە و دابەزی خۆی و سوپاکەی حەوانەوە و دواتر بەرەو خەزەر بەرێکەوتن و لەروباری (کوڕ، کەڕ؟!)

پەڕینەوە. بیستی کە یەکێك لەهاوڕێکانی لەخەڵکی کوێستانەکان نامەی بۆ پاشای ئەرمەنستان نوسی و لەهاتنی جەراح ئاگاداری کردۆتەوە. لەم کاتەدا جەراح فەرمانی بەجارچیەکدا و لەناو خەڵکدا جاڕیدا: فەرماندار بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ لێرە دەمێنێتەوە، تا دەتوانن خۆراك و توێشوی زیاتر هەڵبگرن. ئەو پیاوە نامەی بۆ پاشای خەزەر نوسی و ئاگاداری کردەوە کەجەراح دەمێنێتەوە، فەرمانی پێدا لەشوێنەکەی خۆی نەجوڵێت تا موسوڵمانان چاوی تەماحی تێ نەبڕن.

کاتێك شەو داهات، جەراح فەرمانی بەڕێکەوتنی بەسوپاکەیدا. بەخێرایی بەڕێکەوت تا گەشتە شاری باب و ئەبواب بەڵام خەزەریەکانی نەبینی. ڕۆشتە ناو شارەکە و سوپاکەی خۆی بۆ هەمو سوچ و کەنارەکان ڕەوانە کرد کە دەستیان بەتاڵانی و ڕاوروت کرد. تاڵانیەکانیان کۆکردەوە و بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە گەڕانەوە. خەزەریەکان بەفەرماندەیی شازادەکەیان ڕوبەڕویان بونەوە و لەکەناری ڕوباری ڕان شەڕێکی قورسیان دەست پێکرد. جەراح هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕهاندا و شەڕ بەشێوەیەکی دژوار و سەخت بەردەوام بوو. بەسەر خەزەریەکاندا زاڵبون و بۆ هەڵاتن ناچاریان کردن. موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتن و تا توانیان کوشتیان و دیلیان کرد. دەستەیەکی فراوان لەوان کوشتار کران و موسوڵمانان هەمو سامانەکانی ئەوانیان وەك تاڵانی هەڵگرت و بەڕێکەوتن تا لەقەڵایەك بەناوی (قەڵای ورد)(حوصەین) دابەزین. خەڵك لەسەر بنەمای وەرگرتنی ئەمان و تەسلیم کردنی سامانەکان بەموسوڵمانان ملکەچیان بون. جەراح ڕازی و لەوێ کۆچی کرد.

ڕۆشتە شارێك بەناوی یەرغوا و بۆ ماوەی شەش ڕۆژ گەمارۆی لەسەر خەڵکەکەی دانا و هەوڵیدا تا بەزۆر و زەنگ تێکیان بشکێنێت. خەڵکی ئەو شارە داوای ئەمانیان کرد کە پێیان بەخشرا. جەراح قەڵاکەی لێ سەندن و ئەوانی لەوێ دەرپەڕاند.

دواتر جەراح بەرەو بەلەنجەر بەڕێکەوت کە قەڵایەکی بەهێز و ناودار لەقەڵاکانی ئەوان بو. بۆ گرتنی ئەو قەڵایە مەبەستی شەڕی کرد. دانیشتوانی ئەو قەڵایە سێسەد گەردونەیان کۆکردبویەوە و لەدەوروبەری قەڵاکەی خۆیان دایاننابو تا قەڵاکەیان بپارێزن و موسوڵمانان لەهاتنە ناو قەڵاکە ناتەوان بن. ئەو گەردونانە دژوارترین و سەخترین لەمپەری ڕێگەی موسوڵمانان بو. کاتێك بینیان لەوان زیانیان بەردەکەوێت،

دەستەیەك لەوان، نزیکەی سی پیاو، هەنگاویان بردە پێش و خۆبەخشانە بۆ مەرگ پەیمانیان بەست و کالآنی شمشێرەکانی خۆیان شکاند و هاوشێوەی یەك پیاو هێرش و بەرەو گەردونەکان پێشرەویان کرد. دانیشتوانی ناو قەلاکە بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان تێدەکۆشان و تیربارانێکی ئەوتۆیان دەستپێکرد کە تیشکی هەتاوی داپۆشی و سێبەری دروست کرد. ئەو سی کەسە نەگەڕانەوە تا گەشتنە گەردونەکان و خۆیان پێوە هەڵواسی و ئەو تەنافانەیان پچڕاند کەئەوانی بەیەکەوە دەبەست و بەرووی موسوڵماناندا تلێریان کردنەوە بەشێوەیەك تەپ و تۆزیان بەرز کردەوە و موسوڵمانانی پێشێل کرد. شەڕ بەقورسی بەردەوام و هەمویان بێزار، وەك بڵێی گیانیان گەشتبوە سەر لێو. سەرئەنجام خەزەریەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان بەزۆر ڕۆشتنە ناو قەلاکە و هەمو سامانەکەیان تالآن کرد. ئەم شەڕ لەمانگی رەبیع الاول/ ئوتی ٧٢٢ زایینی رویدا. هەر سوارەیەك سێسەد دیناری بەرکەوت. ژمارەی شەڕکەران سی و چەند هەزار کەس بون.

جەراح منالّ و ژنی پاشای بەلەنجەری گرت و کەسێکی رەوانە کرد کەپاشای هێنا. ژن و منالّ و قەلاکەی بۆ گەڕاندەوە و ئەوی وەك سیخوڕێك دەستنیشان کرد تا لەکاروباری ناباوەڕان بەئیسلام ئاگاداریان بکاتەوە.

ئەوان لەسەر بنەمای پێدانی ئەندازەیەك لەسامان ئاشتیان لەگەڵ کرد. دواتر خەڵکی سەرزەمینەکان کۆبونەوە و ڕێگەیان لەموسوڵمانان گرت. پاشای بەلەنجەر نامەی بۆ جەراح نوسی و لەم کارە ئاگاداری کردەوە. ئەو بەخێرایی بەڕێکەوت تا گەشتە گوندی (ملی) و لەم کاتەدا روبەرووی زستان بویەوە. موسوڵمانان لەوێ مانەوە و جەراح نامەی بۆ یەزید کوڕی عەبدولەلیك نوسی و ئاگاداری کردەوە کەتوانیویەتی دەست بەسەر چەندین ناوچە و سەرزەمیندا بگرێت. یەزید بەڵێنی پێدا سوپایەك بۆ هاوکاری کردنی رەوانە بکات، بەلآم پێش ئەوەی بتوانێت ئەم ئەرکەی راپەرێنێت، مالئاوایی لەجیهان کرد و هوشام کوڕی عەبدولەلیك کوڕی مەروان کەسی بۆ لای جەراح رەوانە کرد و فەرمانڕەوایەتی ئەوی پشت راست کردەوە و بەڵێنی هاوکاری پێدا.

## لەسەر کار لابردنی عەبدولرەحمان کوڕی زوحاك لەمەککە و مەدینە

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی عەبداللە، عەبدولرەحمان کوڕی زوحاکی لەفەرمانداری مەککە و مەدینە لابرد. عەبدولرەحمان بۆ ماوەی سێ ساڵ فەرمانداری ئەم ناوچەیە بو. یەزید عەبدولواحیدی نەزری بۆ جێگەی ئەو دەستنیشان کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەو بو کە عەبدولرەحمان لەفاتیمە کچی حسین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب خوازبێنی کرد. فاتیمە وتی: نامەوێت شوو بکەم چونکە سەرقاڵی کاروباری تایبەت بەکوڕەکانی خۆمم. زوحاك پێداگری کرد و وتی: ئەگەر رازی نەبیت، کوڕە گەورەکەت( عەبداللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی) بەبیانوی خواردنەوە قامچی باران دەکەم. سەرپەرەستی دیوانی مەدینە پیاوێکی خەڵکی شام بو بەناوی کوڕی هورموز. ئەو حسێبەکانی خۆی هەڵگرت و مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای یەزیدی کرد. ڕۆشتە لای فاتیمە تا ماڵئاوایی لێبکات. پرسی: هیچ نیازێکت هەیە.؟ فاتیمە وتی: سەروەری باوەڕداران ئاگادار بکەرەوە کە لەدەستی کوڕی زوحاك چیم بەسەر دێت و چۆن ئازارم دەدات. فاتیمە خۆی بەکەسێکی دیکە نامەیەکی بۆ یەزید رەوانە کرد و ئەوی لەچۆنیەتی ئەم کارە ئاگادار کردەوە.

کوڕی هورموز ڕۆشتە لای یەزید کە سەبارەت بەمەدینە پرسیاری کرد و وتی: ئایا سەبارەت بەپیاوی گوناحکار هیچ هەواڵێکت پێیە؟ کوڕی هورموز سەبارەت بەفاتیمە هیچی نەوت. دەرگاوان بەیەزیدی وت: لەدەرگای کۆشك نێردراوی فاتیمە کچی حسین وەستا. کوڕی هورموز وتی: ئەم خاتوونە نامەیەکیشی بەمنداوە. یەزیدی ئاگادار کردەوە. یەزید لەتەختەکەی هاتەخوار و وتی: ئەی بێ دایك و باوك، ئەم هەواڵەت پێیە و دەیشاریتەوە؟ کوڕی هورموز داوای لێبوردنی کرد و وتی لەبیری کردوە. یەزید فەرمانی بەنێردراوەکەی فاتیمەدا. نامەی ئەو خاتونەی وەرگرت و خوێندیەوە و لەکاتی خوێندەوە بەردەوام بەداردەستەکەی دەیکێشا بەدەستی خۆیا و دەیوت: کوڕی زوحاك بەتەواوی بێ شەرم بوە! کەس هەیە بتوانێت هاوار و ناڵەی لەژێر ئەشکەنجە بەمن بگەیەنێت؟ وتیان: عەبدولواحید کوڕی عەبداللەی نەزری دەتوانێت. یەزید دەستبەجێ

بەخەتی خۆی نامەی بۆ عەبدولواحید نوسی: تۆم کردە فەرمانداری مەدینە، بەرێکەوە و چل هەزار دینار وەك تاوان لەکوڕی زوحاك بستێنە و ئەوەندە ئەشکەنجەی بکە تا لەجێگەکەی خۆمەوە دەنگی ناڵاندی ببیستم.

نامەبەر بەرێکەوت. نەڕۆشتە لای کوڕی زوحاك. ئاگاداریان کردەوە کە نامەبەری بانگ کرد و هەزار دیناری پێدا تا لە ناوەرۆکی نامەکە ئاگاداری بکاتەوە. نامەبەر ئاگاداری کردەوە. کوڕی زوحاك بەپەلە بەرێکەوت و ڕۆشتە لای مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك و داوای کرد پەنایی بدات. مەسلەمە ڕۆشتە لای یەزید و نیازی خاڵۆی لەگەڵدا باس کرد. یەزید وتی: جگە سەبارەت بە کوڕی زوحاك، داوای هەرچی دەکەی، بەتۆی دەبەخشم. وتی: سوێند بەخوا مەبەستم ئەوە. یەزید وتی: سوێند بەخوا نایبەخشم. ئەوی بۆ مەدینە بۆ لای کوڕی واحید رەوانە کرد کە بەسەختی ئەشکەنجەی کرد. کوڕی زوحاك دوای ئەوە لەبەردەرگای ماڵ دادەنیشت و سواڵی دەکرد.

بەرێکەوتنی عەبدولواحیدی نەزری لەشوالی ساڵی ١٠٤/ مارسی ٧٢٣ زایینی بو. کوڕی زوحاك هەمو ئەنساریەکانی رەنجاند و لەبەر ئەمە شاعیران زمانیان بۆ ئیهانە کردنی ئەو کردەوە و چاکەکاران ئەویان سەرکۆنە کرد. کاتێك عەبدولواحیدی نەزری بوبەفەرمانداری ئەوان، کردارێکی چاکەی گرتەبەر و خەڵك هاورێیەتیان لەگەڵ بەهێز کرد. پیاوێکی چاکەکار بوو و پێش ئەنجامدانی کارەکان لەگەڵ قاسم کوڕی محەممەد و سالم کوڕی عەبداللە راوێژی دەکرد.

## لەدایك بونی ئەبوئەلعەباسی سەفاح

لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الثانی/ سێپتامبەری ٧٢٢ زایینی ئەبو ئەلعەباس عەبداللە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عەباس ناسراو بەناوی سەفاح( خوێنرێژ) چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەبو محەممەد صادق لەگەڵ چەند کەسێك لەهاورێکانی خۆی لەخوراسانەوە ڕۆشتنە لای باوکی ئەو محەممەد کوڕی عەلی. ئەبوئەلعەباسی بردە لای ئەوان کە لەقۆنداقەوە پێچرابو و هێشتا تەمەنی پانزە ڕۆژ بو. ئەبو محەممەد صادق پێی وت: ئەمە، پاشای ئێوەیە و ئەم جڵەوی کارەکان دەگرێتە دەست. سەر و دەستی ئەویان ماچ کرد. صادق بەوانی وت: سوێند بەخوا جڵەوی کاروبارەکان دەگرنە دەست تا تۆڵەی خۆتان لەدوژمنان بستێننەوە.

## لەسەر کار لابردنی سەعیدی حەرەشی

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی هوبەیرە، سەعیدی حەرەشی لەفەرمانڕەوایەتی خوراسان لابرد و موسلیم کوڕی سەعید کوڕی ئەسلەم کوڕی زورعەی کەلابی لەجێگەی ئەودانا.

هۆکارەکەی ئەوە بو کە وتمان: کوڕی هوبەیرە نامەی بۆ حەرەشی نوسی تا دیوشتی ئازاد بکات بەڵام ئەو کوشتی. ئەو کوڕی هوبەیرەی بەسووك لەقەڵەمدەدا و بە ئەبو موسەنا ناوی دەبرد. دەیوت: ئەبو موسەنا ئەمەی وت، ئەبو موسەنا ئەوەی کرد. هوبەیرە لەم کارانەی ئاگادار بویەوە کەجومەیل کوڕی عیمرانی ڕەوانە کرد تا لەهەڵس و کەوتی حەرەشی ئاگادار ببێتەوە. جومەیل وای نیشاندا کەمەبەستی سەیر کردنی دەفتەرەکانە. کاتێك ڕۆشتە لای حەرەشی، وتی: ئەبو موسەنا چۆنە؟ پێیان وت: جومەیل بۆ ئاگادار بون لەهەڵس وکەوتی تۆ هاتوە. کاڵکێکی ژەهراوی کرد و بۆی نارد کەخواردی و نەخۆش کەوت و مووی جەستەی وەری. خۆی دەرمان کرد و چاك بویەوە و بۆ لای کوڕی هوبەیرە گەڕایەوە و لەهەمو کارەکانی حەرەشی ئاگاداری کردەوە و وتی: کردارەکانی لەوە ناپەسەندترە کە تۆیان لێ ئاگادار کردۆتەوە، حەرەشی تۆ بەکارگوزاری خۆی دەزانێت. کوڕی هوبەیرە تورە بو و ئەوی لەسەر کار لابرد و مێرووی کردە ناو سکی و ئەوەندە ئەشکەنجەی کرد تا سامانەکانی گەڕاندەوە.

جارێك کوڕی هوبەیرە لە شەونشینیەك، پرسی: سەروەری قەیس کێیە؟ وتیان: تۆ سەروەرمانی. وتی: جگە لەمن، سەروەری قەیس کەسەر کوڕی زوفەرە. ئەگەر شەوێك ئاگر بکاتەوە و هاوار بکات، بیست هەزار پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆدەبنەوە و کەس ناپرسێت: بۆ ئێمەت لەدەوری خۆت کۆکردۆتەوە؟ سوارکارو پاڵەوانی ئەوان ئەم کەرەیە کە زیندانیمان کردوە و دەمەوێت خوێنی برێژم (مەبەستی حەرەشی بو) بەڵام ئەگەری هەیە باشترین پیاوی قەیسیەکان من بم. عەرەبێکی بیابان نشین لەخەڵکی بەنی فەزارە پێی وت: ئەگەر بەوشێوە بێت کەتۆ دەڵێیت، پاڵەوانی قەیسیەکانت نەدەکوشت. ئەو کەسی بۆ لای مەعقەل کوڕی عوروە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا نەیکوژێت. ئەوی بەمەعقەل سپاردبو تا خوێنی برێژێت. بەسەرهاتەکە بەمشێوە بو کاتێك کوڕی هوبەیرە، موسلیم کوڕی سەعیدی کردە فەرمانڕەوایی خوراسان، فەرمانی پێدا حەرەشی بگرێت و بەدیل کراوی ڕەوانەی بکات. موسلیم گەیشتە بەر دەرگای کۆشکی فەرمانداری

وبینی داخراوە. بەحەرەشیان وت: موسلیم هاتوە. کەسی ڕەوانە کرد و پرسی: وەك فەرماندار هاتویت یا وەك وەزیر یا سەردانەکەر؟

حەرەشی هاتە لای کە جوێنی پێدا و زیندانی کرد. دواتر فەرمانی بەزیندانوانەکەیدا بەچەندین زنجیر بیبەستنەوە. حەرەشیان لەم کارە ئاگادار کردەوە. دەبیرەکەی بانگ کرد و وتی: بنوسە کە زیندانوانەکەت دەڵێت فەرمانت بەو داوە من بەچەندین زنجیر ببەستێتەوە. ئەگەر فەرمانت لەسەرەوە پێ بێت، ملکەچ و گوێڕایەڵین و ئەگەر کارێکە خۆت مەبەستی ئەنجامدانی دەکەیت، کردارێکی ناپەسەندە. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

فاما تثقفونی فاقتلونی          و من یثقف فلیس له خلود

هم الاعداء ان شهدوا و غابوا     الو الاحقادو الاکباد سود

یانی: ئەگەر من بگرن، دەمکوژن، هەرکەسێك بگرن، نامێنێتەوە. ئەوانە دوژمنن چ لێرەبن چ نەبن، تۆڵەستێن و ڕقاوین و دڵیان ڕەشە.

کاتێك کوڕی هوبەیرە لەعێراق هەڵات، خالیدی قەسری چەندین کەسی بۆ گەڕان بەدوای حەرەشی ڕەوانە کرد. پیاوێك ئەوی لەکەنارەکانی فورات بینی و وتی: سەبارەت بەمن گومانی چی دەکەیت؟ وتی: گومان دەکەم پیاوێك لەخەڵکەکەی خۆت تەسلیمی قەیسیەکان ناکەیت. پیاو وتی: ڕاستت وت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولواحید کوڕی عەبداللەی نەزری نایبنی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. فەرمانڕەوای عێراق و ڕۆژهەڵات عومەر کوڕی هوبەیرە بو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە حسین کوڕی حەسەنی کێندی و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە عەبدولمەلیك کوڕی یەعلی.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەبو قەلامەی جەرمی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٠٧/ ٧٢٥ زایینی مرد، عەبدولرەحمان کوڕی حەسەن کوڕی سابتی ئەنساری، یەحیا کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعە، عامر کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاص، موسا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیداللە، ئەبو عەبداللە هومەیر کۆیلەی کوڕی عەبباس، خالید مێعران کوڕی ئەبی کەربی کەلاعی دانیشتوی شام.

## ڕوداوەکانی ساڵی سەد و پێنجی کۆچی (٧٢٣ زایینی)

### شۆڕشی عوقفان

لە ڕۆژگاری یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، پیاوێکی حەروری (لەخەواریج) بەناوی عوقفان هاورێ لەگەڵ هەشتا پیاو شۆڕشی کرد. یەزید مەبەستی ئەوەی کرد سوپایەك بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە بکات. پێیان وت: ئەگەر لەم سەرزەمینەدا بکوژرێت، خەواریج لەو شوێنەدا کۆدەبنەوە، باشترە بۆ لای هەر پیاوێك لەپیاوەکانی کەسێك لەبنەماڵەکەی خۆی ڕەوانە بکەیت تا قسەی لەگەڵ بکات و پەشیمانی بکاتەوە. یەزید ئەو کارەی کرد. کەسەکانیان پێیان وتن: دەترسین ئێمە بەتاوانی گوناحکاری ئێوە سزا بدەن. ئەمانیان پێ بەخشین کە لەدەوری عوقفان بلاوەیان لێکرد و عوقفان بەتەنیا مایەوە. یەزید براکەی بۆ لای ئەو نارد کە دڵی نەرم کرد و بۆ ماڵەکەی گەڕاندیەوە. کاتێك هوشام کوڕی عەبدولمەلیك هاتەسەرکار، لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە بە نافەرمانان و شۆڕشگێرانی بەو سپارد. کوڕی عوقفان بەشێوەیەکی توڕە هاتە لای ( و مەبەستی شۆڕشی کرد). عوقفان ئەوی بەند کرد و بۆ هوشامی ڕەوانە کرد. هوشام بۆ ڕێز گرتن لەباوکی ئازادی کرد و وتی: ئەگەر عوقفان دەیویست خیانەت لەئێمە بکات، کاری کوڕەکەی لەئێمە دەشاردەوە. هوشام عوقفانی کردە لێپرسراوی کۆکردنەوەی زەکات کەتا کۆتایی تەمەنی هوشام ئەم ئەرکەی لەئەستۆدابو.

### شۆڕشی مەسعودی عەبدی

مەسعود کوڕی ئەبی زەینەبی عەبدی لەبەحرەین دژی ئەشعەس کوڕی عەبداللە کوڕی جارود شۆڕشی کرد. ئەشعەس بەحرەینی بەجێهێشت و چۆڵی کرد. مەسعود ڕۆشتە یەمامە کەسوفیان کوڕی عەمرۆ عەقیلی فەرمانڕەوایەتی دەکرد. عومەر کوڕی هوبەیرە بۆ ئەو کارە دەستنیشانی کردبوو. سوفیان بۆ شەڕی ئەو ڕیزی بەست. لەخێزرەمە بەقورسی شەڕی یەکیان کرد کە لەئاکامدا مەسعود کوژرا و دوای ئەو هیلال کوڕی مودلەج فەرماندەیی خەواریجی گرتە دەست و سەراسەری ڕۆژ شەڕی لەگەڵ ئەوان

ئەزمون کرد. کەسانێك لەخەواریج و لەناو ئەوان زەینەب خوشکی مەسعود کوژرا. کاتێك شەو داهات، پیاوەکانی هیلال لەدەوری ئەو بلاوەیان کرد و ئەویان لەگەڵ دەستەیەکی کەم بەجێهێشت. ئەو ڕۆشتە ناو کۆشکێك و سەنگەری گرت. پەیژەکانیان هێنا و بەدیواری کۆشکەکەدا سەرکەوتن. هیلالیان کوشت و شەرکەرەکانی داوای ئەمانیان کرد کە پێیان بەخشرا. فەرزدق سەبارەت بەم شەڕە وتی:

لعمری لقد سلت حنيفة سلة سيوفا ابت يوم الوغى ان تغيرا
تركن لمسعود و زينب اخته رداء و سربالا من المنوت احمرا
ارين الحروريينن يوم لقائهم ببرقان يوما يجعل الموت اشقرا

یانی: سوێند بەگیانی خۆم کە پیاوەکانی حەنیفە ئەو شمشێرانەیان لەکالان دەرکێشا کە لەگۆڕەپانەکانی شەڕ هیچ کات کول نابن. بۆ مەسعود و زەینەبی خوشکی، عابا و پانتۆڵێکی مەرگ هێنەری سوریان بەجێهێشت و لەرۆژی شەڕ لەگەڵ حروریەکان بەلایەکیان بەسەر هێنان کە مەرگیان بەسوورڕەنگ دەبینی.

دەستەیەك دەڵێن: مەسعود بۆ ماوەی نۆزدە ساڵ دەستی بەسەر بەحرەین و یەمامەدا گرت تا سوفیان کوڕی عەمرۆ عەقیلی ئەوی لەناوبرد.

## بەسەرهاتی مەصعەب کوڕی محەممەد والبی

مەصعەب لەگەورەکانی خەواریج بو. عومەیر کوڕی هوبەیرە بەدوایدا گەڕا و هاوڕێ لەگەڵ ئەو بەدوای مالك کوڕی صەعب و جابر کوڕی سەعد. ئەوان ڕۆشتنەدەر و لەخوەرنەق کۆبونەوە و مەصعەب و خوشکەکەی ئامینەیان وەك ڕێبەری خۆیان هەڵبژارد و لەوێ کۆچیان کرد. کاتێك هوشام هاتە سەرکار، خالیدی قەسری کردە فەرمانڕەوایی عێراق. خالید سوپایەکی بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد کە لەحەزە لەدەوروبەری موسڵ کۆببونەوە. روبەروی یەك بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد و خەواریج کوژران. دەڵێن: کوشتاری ئەوان لەدواییین رۆژەکانی فەرمانڕەوایی یەزید کوڕی عەبدولەلیك بو. یەکێك لەمبارەوە و وتویەتی:

فتية تعرف التخشع فيهم كلهم احكم القران اماما
قد برى لحمه التجهد حتى عاد جلدا مصفرا و عظاما
غادروهم بقاع حزة صرعى فسقى الغيث ارضهم يا اماما

یانی: ئەو گەنجانەی بەئاشکرا بەدبەختی لەواندا دەبینی کەهەموویان بەجوانترین شێوە فێری قورئان بون و لەبەریان کردوە. نوێژ و پاڕانەوەی زۆر گۆشتی ئەوانی دارزاندوە بەشێوەیەك پێستێکی زەرد و ئێسقانێکی قرنجاو لەوان بەجێماوە. ئەوانیان گەوزاو لەخاك و خوێن لەدەشتی حەزە بەجێهێشت، خۆزگە بارانی خۆشەویستی خواوەند بەسەر ئەواندا ببارێت.

## مردنی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك

لەم ساڵەدا، پێنج رۆژ بۆ کۆتایی شەعبان/ ٢٦ ژانویەی ٧٢٤ زایینی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك لەتەمەنی ٤٠ یا ٣٥ ساڵی یا کەمتر یا زیاتر، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. رۆژگاری خەلافەتی ئەو چوارساڵ ویەك مانگ و چەند رۆژێکی خایاند. نازناوەکەی ئەبوخالید بو. ئەو بەهۆی نەخۆشی سیل مرد.

دەڵێن: کاتێك کەنیزە جوان روخسارەکەی بەناوی حەبابە مرد، بەتەواوی لەمەرگی ئەو خەمبار و خەمۆك بو کە بەخواستی خوای گەورە ئاماژەی پێدەدەین. ئەو بۆ پێشوازی کردن لەجەستەی حەبابە رۆشتەدەر و براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك بەردەوام دڵنەوایی دەکرد. یەزید وەڵامی نەدایەوە. دەڵێن: یەزید دوای ئەو لەرێگە رۆشتن و سوار بونی ئەسپ ناتەوان و فەرمانی بەمەسلەمەدا نوێژی لەسەر بکات. دەڵێن: مەسلەمە رێگەی ئەم کارەی لێگرت تا خەڵك لاوازی ئەو نەبینن و رەخنەی لێنەگرن. کاتێك حەبابە بەخاك سپێردرا، بۆ ماوەی پانزە رۆژ ژیا و دواتر مرد و لای گۆڕەکەی ئەو بەخاك سپێردرا. دەستەیەك دەڵێن: دوای ئەو کەنیزە، بۆ ماوەی چل رۆژ ژیا و لەم ماوەدا هەر کەسە و تەنیا یەك جار توانی سەردانی بکات. کاتێك یەزید مرد، براکەی مەسلەمە یا کوڕەکەی وەلید نوێژی لەسەر خوێند. هوشام کوڕی عەبدولمەلیك لەحیمص بو.

## ڕێگە و کرداری یەزید کوڕی عەبدولمەلیك

یەزید لەجوامێرەکانی عەرەب بو. ڕۆژێك (سلامه القس) سەلامەی قەشە و حەبابە (هەردوکیان لەجوانترین ژنانی جیهان) لای ئەو دانیشتبون. لەشادمانی و خۆشی هاتە جۆش و وتی: دەمەوێت بفڕم. حەبابە پرسی: ئەم ئۆمەتە بەکێ دەسپێریت؟ وتی: بەتۆی نازەنین! ڕۆژێك حەبابە گۆرانیەکی بۆ خوێند کە ئەم شێعرەی تیا بو:

و بین التراقی و اللهاة حرارة          ما تطمئن و ما تسوع فتبردا

یانی: لەنێوان خۆش و شوێنی جگەر، ئاگرێکی جەرگبڕە کە نەئارام دەگرێت و نەدادەمرکێتەوە تا دڵ زیاتر نەسوتێت.

یەزید ئارەزوی فڕینی کرد. حەبابەی مانگ ڕوخسار پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، من نیازم بەتۆ هەیە. یەزید وتی: سوێند بەخوا دەفڕم! حەبابە وتی: ئەم ئۆمەتە بەکێ دەسپێریت؟ ئەم پاشایەتیە بۆ کێ بەجێ دێڵیت؟ یەزید وتی: سوێند بەخوا بەتۆی دەسپێرم. ئەوسا دەستە سپیەکانی ئەوی ماچ کرد. یەکێك لەنۆکەرەکان هاتەدەر و بەردەوام دەیوت: چاوت سور بێت، چەندە پیاوێکی سەرسەریت تۆ!

ڕۆژێك یەزید لەگەڵ ئەو ڕۆشتە پانتاییەکانی ئەردەن و یەزید دەنکێ ترێی بۆ هاویشت کەحەبابە هەڵیگرت و ماچی کرد و خستیە دەمی، بەڵام لەقوڕگی گیری کرد و ئەو مانگ ڕوخسارە نەخۆش کەوت و مرد. یەزید ڕێگەی نەدا تا سێ ڕۆژ بەخاکی بسپێرن تا ئەوەی بۆگەنی کرد و یەزید بۆنی دەکرد و ماچی دەکرد و دەگریا. داوایان لێکرد ڕێگە بدات تا بەخاکی بسپێرن و یەزید فەرمانی ئەو کارەی دەرکرد و خەمبار و خەمۆك بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. لەکەنیزێکی بیست کە دەڵێت:

کفی حزنا بالهائم الصب ان یری          منازل من یهوی معطلة قفرا

یانی: بۆ شەیدای دڵ لەدەست داو، ئەوەندە بەسە ماڵە ڕەنگینەکانی نازەنین بەچۆڵ و داخراو ببینێت.

یەزید بەکوڵ گریا. دوای ئەو حەوت ڕۆژ ژیا و چاوی بەخەڵکان نەکەوت. مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك داوای لێکرد لەماڵەوە بمێنێتەوە نەکا کارێکی نەشیاو بکات و خەڵك

ئیرادی لێ بگرن.

یەزید لەرۆژگاری سلێمانی برای حەجی کرد و حەبابەی بەچوار هەزار دینار کڕی. ناوی عالیە بو. سلێمان وتی: مەبەستی ئەوەم هەیە یەزید لەخەلافەت دور بکەمەوە و ئەو لەسەر کارەکەی لابەرم. یەزید ئەو مانگ روخسارەی گەڕاندەوە کەپیاوێکی میسری ئەوی کڕی. کاتێك خەلافەت بەیەزید گەیشت، ژنەکەی سەعدە پێی وت: ئایا لەم جیهانەدا ئارەزویەکت هەیە نەهاتبێتەدی. یەزید وتی: بەڵێ، حەبابە. ژن کەسی بەدوای ئەو مانگ روخسارەدا رەوانە کرد و کڕی و بەخشڵ و زێڕ و زیو رازاندیەوە و لەپشت پەردەوە دایشارد و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا چێژێك هەیە تامت نەکردبێت؟ یەزید وتی: پێم وتیت. ژن پەردەکەی لادا و وتی: ئەوە حەبابە! هەستا و ئەوی لەگەڵ حەبابە بەتەنیا جێهێشت. یەزید، رێزی لەسەعدە گرت و خۆشەویستی خۆی پێبەخشی. سەعدە کچی عەبداللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمان بو. کاتێك یەزید مرد، کەس لەمەرگی ئەو ئاگادار نەبویەوە تا سەلامە گریان و شین و رۆرۆی دەست پێکرد.

| | |
|---|---|
| لا تلمنا ان خشعنا | او هممنا بخشوع |
| قد لعمری بت لیلی | کاخی الداء الوجع |
| ثم بات الهم منی | دون من لی بضجیع |
| للذی حل بنا الیو | م من الامر الفظیع |
| کلما ابصرت ربعا | خالیا فاضت دموعی |
| قد خلا من سید کا | ن لنا غیر مضیع |

یانی: ئەگەر بەدبەخت و ریسوا ببین و شین و رۆرۆ بکەین، زمان بۆ سەرکۆنە کردنی ئێمە مەکەرەوە. سوێند بەگیانی خۆم کە دوێ شەوم وەك نەخۆشێکی بەئازار کردە رۆژ. دواتر خەمەکان هاتن و هاوجێگەکەی منیان لەمن جیا کردەوە. هۆکارەکەی، ئەو داخە سوتێنەرە بو ئەمڕۆ بەسەرمان هات. هەر جار کەماڵێکی چۆڵ ببینم، لافاوی فرمێسك لەچاوەکانم دەبارێنم. جیهان چۆڵ و سەروەری کۆچی کرد کە هیچ کات ئێمەی پێشێل نەدەکرد.

دواتر هاواری کرد: ئەی هاوار، سەروەری باوەڕداران! خەڵکان لەمەرگی ئەو ئاگادار بونەوە. ئەو هۆنراوەیە هی پیاوێکی ئەنساریە.

گێڕانەوەی بەسەرهاتی یەزید لەگەڵ سەلامەی قەشە فراوانە کە لەئێستادا کاتی باس کردنیان نیە.

لەبەر ئەوە پێی دەڵێن سەلامەی قەشە چونکە ئەو بەسەرهاتێکی لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی عەبداللە کوڕی ئەبی عەمار، یەکێك لەپیاوانی بەنی جوشەم کوڕی معاویە کوڕی بوکەیر هەیە. ئەو پیاوێکی خواپەرەست بو، نوێژی زۆری دەخوێند و لەبەر ئەمە بەقەشە ناویان دەبرد. ئەم قەشەیە رۆژێك لای ماڵی ئەو پەیکەر سیمینە تێپەڕی و بینی کە گۆرانی دەخوێنێت. وەستا و گوێی لەگۆرانیەکەی گرت. هاتەدەر وپیاوی خواپەرەستی بینی و وتی: دەتەوێت ببینیت و ببیستیت؟ خواپەرەست رازی نەبو. وتی: ئەو لە شوێنێك دادەنێم کە تەنیا دەنگی ببیستیت و روخساری نەبینیت. خواپەرەست رۆشتە ژور و کەنیزەکە دەستی بە گۆرانی خوێندن و قەشەی شەیدای خۆی کرد. دواتر گەورەکەی ئەوی نیشانی پیاوی خواپەرەستدا. خواپەرەست بەتەواوی عاشق و شەیدایی بو و ئەو مانگ روخسارە عەشقی ئەوی بەگیان کڕیەوە. رۆژێك کە پێکەوە تەنیا بون، کچەکە وتی: سوێند بەخوا تۆم خۆش دەوێت. گەنجی خواپەرەست وتی: سوێند بە خوا منیش تۆم خۆش دەوێت. کچ وتی: دەمەوێت ماچت بکەم. گەنج وتی: منیش تینوی ماچێکی تۆم. کچ وتی: دەمەوێت سکم بخەمە سەر سکت. گەنج وتی: منیش ئارەزومە. کچ وتی: کەواتە چ شتێك رێگەت لێ دەگرێت. وتی: ئەم فەرمودەی خوای گەورە: هاورێیان لەم رۆژەدا (رۆژی هەستانەوە) دوژمنی یەکترن مەگەر خۆپارێزان (زخرف/٤٣/٦٧). دەترسم هاورێیەتیمان بۆ دوژمنایەتی بگۆڕێت. دواتر هەستا و لێی دورکەوتەوە و نوێژی خوێند. قەشە چەندین هۆنراوی بۆ ئەو هۆنیوەتەوە، یەکێك لەوان:

الم ترها لا يبعد الله دارها      اذا طربت فى صوتها كيف تصنع

تمد نظام القول ثم ترده      الى صلصل من صوتها يترجع

یانی: ئایا ئەو مانگ روخسارەت نەبینی؟ ماڵەکەی دور نەبێت! کاتێك لە گۆرانی وتن دێتە جۆش، چی ناکات! خوێندن درێژ دەکاتەوە و دواتر دەیگەرێنێتەوە و لەقوڕگی خۆیەوە چەهچەهەیەك لێدەدات کە بولبولەکان لەتاو رژدی بردن بەو گیان دەدەن.

دوبارە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| الا قل لهذا القلب هل انت مبصر | و هل انت عن سلامة اليوم مقصر |
| الا ليث انى حيث صارت بها النوى | جليس لسلمى كلما عج مزهر |
| اذا اخذت فى الصوت كاد جليسها | يطير اليها قلبه حين ينظر |

یانی: بەدڵی من بڵێ ئایا دەتوانی بیبینە هۆش! ئایا لەدوری سەلامە ئەمڕۆ دەتوانی بەئارامی بەسەر بەریت! خۆزگە سەلەمی لەهەر شوێنێك دادەبەزی و مەنزڵی دەکرد و (نا)ی نازەنینی ئەو چەنگی شەرمەزار دەکرد، من هاونشینی دەبوم. کاتێك گۆرانی دەست پێبکات و هاونشین سەیری چاوەکانی بکات، دڵ وەك مەلی دەستەمۆ ئارەزو دەکات بەرەو لای ئەو بفرێت.

لەبەر ئەمە پێیان دەوت سەلامەی قەشە.

## خەلافەتی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك

لەم ساڵەدا چەند رۆژێك بۆ کۆتایی مانگی شەعبان/ کۆتاییەکانی ژانویەی ٧٢٤ زایینی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك هاتە سەر تەختی خەلافەت. ساڵەکانی تەمەنی لەکاتی گرتنەدەستی خەلافەت سی و چوار ساڵ و چەند مانگ بو. لەدایك بونی لەرۆژی کوژرانی مەصعەب کوڕی زوبەیر لە ٧٢/ ٦٩١ زایینی بو. عەبدولمەلیك ناوی نا مەنسور و دایکی ناوی باوکی خۆی (هوشام کوڕی ئیسماعیل کوڕی هوشام کوڕی وەلید کوڕی موغەیرەی مەخزومی) لێنا و عەبدولمەلیك گلەیی لەم کارە نەکرد. دایکی عایشە کچی هوشام ژنێکی گول بو کەعەبدولمەلیك تەلاقیدا. نازناوەکەی ئەبو وەلید بو. لە روصافە ئاگاداریان کردەوە کەوەك خەلیفە هەڵبژێردراوە. نامەبەر رۆشتە لای ئەو و مۆر و داردەستەکەی پێدا و خەڵکان وەك خەلیفە سڵاویان بۆ نارد. لەوێوە بەرەو دیمەشق بەرێکەوت.

## فەرمانداری خالیدی قەسری لەعێراق

لەم ساڵەدا هوشام، عومەر کوڕی هوبەیرەی لەفەرمانڕەوایەی عێراق دور خستەوە و خالید کوڕی عەبداللەی قەسری لەمانگی شەوال/ مارسی ٧٢٤ زایینی بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرد.

عومەر کوڕی یەزید کوڕی عومەیری ئوسیەدی دەڵێت: ڕۆشتمە لای هوشام و خالیدم لەوێ بینی کەباسی فەرمانبەری خەڵکانی یەمەنی دەکرد. وتم: تا ئێستا درۆی لەم چەشنەم نەبیستوە. سوێند بەخوا هیچ ئاژاوەیەك لەناو ئیسلامدا دروست نەبو مەگەر ئەوەی یەمانیەکان تیایدا بەشدار بون، ئەوان عوسمانیان کوشت و سەرپێچی فەرمانەکانی عەبدولمەلیکیان کرد، هێشتا شمشێرەکانی ئێمە بەخوێنی بنەماڵەی موهەلیب سورە. دەڵێت: کاتێك هەستام، یەکێك لەپیاوە مەروانیەکان بەدوامدا هات و وتی: ئەی برای تەمیمی، خێوەتەکەی من لەدەسچیلەکەی تۆ ئاگری گرت. وتارەکەتم بیست بەلاّم ویستم لەمە ئاگادارت بکەمەوە کەسەروەری باوەڕداران خالیدی وەك فەرمانڕەوایی عێراق دەستنیشان کردوە، چیتر ئەوێ شوێنی تۆ نیە! خالید هەمان ڕۆژ بەرەو عێراق بەرێکەوت.

## بانگەوازی بەنی عەباس

دەڵێن: لەم ساڵەدا بوکەیر کوڕی ماهان لەپانتاییەکانی سند گەڕایەوە. لەگەڵ جونەید کوڕی عەبدولرەحمان لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد. کاتێك جونەید لەسەر کار لابرا، بوکەیر هاتە کوفە و چوار شمشی زیوین و زێڕینی پێبو. چاوی بە ئەبو عێکرەمەی صادق، مەیسەرە، محەممەد کوڕی خونەیس، سالمی ئەعیەن و ئەبو یەحیا موالی بەنی سەلمە کەوت و ئەوان بانگەوازی هاشمیەکانیان لەگەڵدا باس کرد. ڕازی بوو و پەسندی کرد و زێڕ و زیوی بۆ ئەوان خەرج کرد و ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی عەلی. مەیسرە مرد و محەممەد، بوکەیر کوڕی ماهانی کردە جێنشینی ئەو.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا جەراحی حەکەمی لە لان شەڕی کرد و هێرشی کردە سەر ئەو پانتاییە تا شارەکان و قەڵاکانی ئەودیو بەلەنجەر و دەستی بەسەر چەندین ناوچەدا گرت و تاڵانی زۆری دەستکەوت. هەروەها لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عەبدولەلیك لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و دەستەیەك لەشەڕکەرانی (نزیکەی هەزار کەس) رەوانە کرد کە هەموویان کوژران.

هەروەها لەم ساڵەدا، موسلیم کوڕی سەعیدی کەلابی فەرمانداری خوراسان، شەڕی لەگەڵ تورکەکان کرد بەڵام دەستی بەسەر هیچ ناوچەیەکدا نەگرت و گەڕایەوە. تورکەکان شوێنی کەوتن و کاتێك خەڵکان لە ئاوی دەریا تێدەپەڕین، بەوان گەیشتن. فەرماندەیی کۆتایی سوپاکەی عوبەیدالله کوڕی زوهەیر کوڕی حەیان سەرکردەی سوارەکانی بەنی تەمیم بوو. لەبەرابەر تورکەکان خۆڕاگریان کرد تا خەڵك لەروبارەکە پەڕینەوە. موسلیم بۆ شەڕی ئەفشین بەڕێکەوت و خەڵکەکەی لەسەر بنەمای دانی شەش هەزار سەر (مەڕوماڵات) و سپاردنی قەڵاکە بەو، ئاشتیان لەگەڵ کرد. ئەم روداوە لەکۆتایی ساڵی ١٠٥ زایینی/ ٢٨ مەی ٧٢٤ زایینی دوای مردنی یەزید کوڕی عەبدولەلیك رویدا.

هەروەها لەم ساڵەدا مەروان کوڕی محەممەد شەڕی هاوینەی کرد و کمخ و قونیەی لەپانتاییەکانی رۆم گرت.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی هوشام خاڵی هوشام کوڕی عەبدولەلیك حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد. کەسێکی بۆ لای دینداری شارەکە رەوانە کرد و پرسی: لە چ کاتێکدا وتار بۆ خەڵك بخوێنم؟ وتی: رۆژێك دوای (ترویە) (هەشتی زی حەجە) دوای نیمەڕۆ. ئەو پێش نیمەڕۆ وتارەکەی پێشکەش بەخەڵکان کرد و وتی: نێردراو لە لایەن دینداری شارەکە ئەم فەرمانەی پێداوم. دیندار وتی: بەراستی فەرمانم پێدابو کەدوای نیمەڕۆ وتارەکەی پێشکەش بکات. ئیبراهیم شەرمەزار بو.

لەم ساڵەدا لەمەککە، تایف و مەدینە، عەبدولواحیدی نەزری فەرماندار بو، لەعێراق

و خوراسان، عومەر کوڕی هوبەیرە، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە حسین کوڕی حەسەنی کێندی و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە موسا کوڕی ئەنس بو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: کەسیر عێزەت، عێکرەمە موالی ئیبن عەباس کەهاوسەری دایکی سەعید کچی جوبەیر بو، حومەید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٩٥/ ٧١٤ زایینی لەتەمەنی ٧٣ ساڵی کۆچی دوایی کرد، زوحاك کوڕی موزاحیم، عوبەید کوڕی حسین لەتەمەنی ٧٥ ساڵیدا، ئەبورەجای عوتاردی، ئەبو عەبدولرەحمانی عوتاردی، ئەبو عەبدولرەحمانی سولەمی بەناوی عەبدالله کوڕی حەبیب کوڕی رەبیعە لەتەمەنی ٩٠ ساڵی، عەبدالله کوڕی عەبدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب کەدایکی سەفیە خوشکی موختار بو و باوکی وەسیەتی خۆی بەو سپارد، براکەی عوبەیدالله کوڕی عەبدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب برای (لەدایکەوە) سالم کە هەردوکیان زادەی دایکی منالێ بون (لەرۆژگاری یەزید کوڕی عەبدولمەلیك)، ئەبان کوڕی عوسمان کوڕی عەفان کە ئیفلیج ببو( لەم ساڵەدا)، عومارە کوڕی خوزەیمە کوڕی سابتی ئەنساری لەتەمەنی ٧٥ ساڵیدا (لەرۆژگاری یەزید)، موغەیرە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هوشامی مەخزومی، عەتا ءکوڕی یەزیدی جوندەعی لەیسی زادەی ساڵی ٢٥/ ٦٤٦ زایینی کە نیشتەجێی شام بو، عەزاك کوڕی مالکی غەفاری باوکی خەیسەم کوڕی عەزاك و مورەقی عێجلی.

## ڕوداوەکانی ساڵی سەد و شەشی کۆچی ( ٧٢٤ زایینی )

## شەڕ لەنێوان موزەریەکان و یەمانیەکان لەخوراسان

لەم ساڵەدا، لەبروکان لەپانتاییەکانی بەڵخ، لەنێوان موزەریەکان و یەمانیەکان شەڕ دەستی پێکرد.

چۆنیەتیەکەی ئەوەی کە: موسلیم کوڕی سەعید کوڕی ئەسلەم کوڕی زورعە بۆ شەڕ ڕۆشتەدەر و خەڵك لاوازیان لەخۆیان نیشاندا و لەهاوڕێیەتی ئەو خۆیان بەدور گرت. یەکێك لەوان بەختەری کوڕی درهەم بو. موسلیم، نەصر کوڕی سەیار و بەلعا ءکوڕی موجاهید و کەسانی دیکەی بۆ بەڵخ گەڕاندەوە و فەرمانی پێدان خەڵك بۆ شەڕ ڕەوانە بکەن. نەصر ئاگری لەبەردەرگای ماڵی بەختەری و زیاد کوڕی تەریفی باهلی دروست کرد و عەمرۆ کوڕی موسلیم برای قوتەیبە کوڕی موسلیم ڕێگەی ڕۆشتنە ناو بەڵخی لێگرتن چونکە لەم کاتەدا فەرمانڕەوایی ئەو شارە بو. موسلیم کوڕی سەعید لەروبار تێپەڕی و نەصر کوڕی سەیار لەبروکان دابەزی و چەغانیەکان و مەسلەمەی تەمیمی و حەسان کوڕی خالیدی ئەسەدی و کەسانی دیکە لەدەوری ئەو کۆبونەوە. خەڵکی ئەزد و ڕەبیعە لەبروکان لەنیو فەرسەخی نەصر کۆبونەوە و موزەریەکان پەیوەستی نەصر بون و ئەزدیەکان و خەڵکی ڕەبیعە پەیوەستی عەمرۆ کوڕی موسلیم کوڕی عەمرۆ بون و تەغلەبیەکان کەسیان بۆ لای عەمرۆ کوڕی موسلیم ڕەوانە کرد و پەیامیاندا کە تۆ لەنێمەیت. هۆنراوەیەکیان بۆ خوێندەوە کەپیاوێك هۆنیبویەوە و خەڵکی باهلەی کردبوە موالی باهلە. بەنی قوتەیبە لەباهلە بون. عەمرۆ بەمە ڕازی نەبوو. زوحاك کوڕی موزاحیم و یەزید کوڕی موفەزەلی حەدانی لەنێوان ئەوان پەیامەکانیان دەگواستەوە و لەگەڵ نەصر قسەیان کرد و ئەو بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. هاوڕێیانی عەمرۆ کوڕی موسلیم و بەختەری هێرشیان کردە سەر نەصر و نەصر هێرشی کردە سەر ئەوان. یەکەم کەس کە کەوتە سەر زەوی و کوژرا، پیاوێك لەباهلە لە یارانی عەمرۆ کوڕی موسلیم بو کەهاوڕێ لەگەڵ ئەو هەژدە کەس کوژران و عەمرۆ شکستی خوارد و کەسی بۆ لای نەصر ڕەوانە و داوای ئەمانی کرد و نەصر ئەمانی پێ بەخشی. دەستەیەك دەڵێن: عەمرۆ کوڕی موسلیمیان لەناو ئاشێکدا بینی و تەنافێکیان خستە ملی و ئەویان

بردە لای نەصر کە ئەمانی پێبەخشی و هاورێ لەگەڵ بەختەری و زیاد کوڕی تەریف یەکی سەد قامچی لێدان و سەری و ریشی ئەوانی تاشی.

دەستەیەك دەڵێن: سەرەتا نەصر و هاورێکانیان لە موزەریەکان شکستیان خوارد و عەمرۆ کوڕی موسلیم بەپیاوێکی تەمیمی هاورێی خۆی وت: ئەی برای تەمیمی، قونی خەڵکەکەت چۆن دەبینی؟ (بۆ ئەو کارە سەرکۆنەی کرد) دواتر تەمیمیەکان هێرشیان کرد و یارانی عەمرۆ شکستیان خوارد و تەمیمی بەعەمرۆی وت: ئەوە قونی خەڵکەکەی منە! دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری شکستی عەمرۆ ئەوە بو کەخەڵکی رەبیعە لەگەڵ عەمرۆ بون و لەوان و خەڵکانی ئەزد دەستەیەك کوژران. خەڵکی رەبیعە وتیان: ئێمە خۆمان لەعەمرۆ نزیك کردەوە و ئەو گرنگی بەئێمە نەدا، ئێستاکە بۆ لەگەڵ برا و منداڵەکانمان شەڕ بکەین؟ ئەوان خۆیان بەدورگرت و ئەزدیەکان و عەمرۆ شکستیان خوارد و دواتر نەصر ئەمانی پێبەخشین و فەرمانی پێدان پەیوەستی موسلیم کوڕی سەعید ببن.

## شەڕی موسلیم لەگەڵ تورکەکان

دواتر موسلیم لەروبار تێپەڕی و هاوەڵانی پەیوەستی بون. کاتێك گەیشتە بوخارا، نامەی خالید کوڕی عەبداللەیان سەبارەت بەفەرمانڕەوایەتیەکەی لەعێراق پێدا کە فەرمانی دەدا کۆتایی بەشەڕ بێنێت. ئەو بەرەو فەرغانە بەرێکەوت و کاتێك گەیشت، ئاگاداریان کردەوە کەخاقان لەو ناوچەیە نزیك بۆتەوە. بەرێکەوت و سێ فەرسەخی لەرۆژێکدا بڕی. خاقان رووبەرویان بوویەوە و لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانان شەڕی ئەزمون کرد و چوارپێکەی موسلیمی گرت و دەستەیەك لەموسوڵمانانی کوشتار کرد. موسەییب کوڕی بشری ریاحی و بورا ء(لەسوارکارەکانی موهەلیب) کوژران و برای غەوزەك لەخاك و خوێندا گەوزا و خەڵك دژی ئەوان راپەڕین و ئەوانیان لەلەشکرگەکە دەرپەڕاند. موسلیم لەگەڵ خەڵك بەرێکەوت و هەشت رۆژ رێگەی بڕی و ئەوان بەشوێنیانەوە بون. کاتێك رۆژی نۆیەم داهات، مەبەستی دابەزینیان کرد. لەگەڵ خەڵك راوێژیان کرد و بۆچونیان لەسەر مانەوە یەکی گرت و وتیان: کاتێك بەرەبەیان دابێت، دەڕۆینە لەوەرگەکە کە زۆر لەئێمەوە دور نیە، دابەزین و خێوەتەکانیان هەڵنەکرد و خەڵك دەفرو کاڵا قورسەکانیان سوتاند و ئاگریان کردەوە کەبەهاکەی بەهەزار هەزار

(درەم یا دینار؟) خەمڵێنرا. خەڵك لەبەرەبەیاندا بەرێکەوتن و ڕۆشتنە ناو روبار و چاچیەکان و خەڵکی فەرغانە لەخوارەوەی روبارەکە بون. موسلیم کوڕی سەعید وتی: هەمو شەڕکەران سوێند دەدەم تا شمشێر لەکالآن دەربکێشن. ئەو کارەیان کرد و ئەو پانتاییە بو بە(شمشێرەلآن) و خەڵك روباریان بەجێهێشت و پەڕینەوە.

ڕۆژێك مایەوە و لەروبار تێپەڕی و خاقان شوێنیان کەوت. حومەید کوڕی عەبداللە فەرماندەی کۆتایی سوپاکە، پەیامی بۆ نارد: چاوەڕێی من بکە چونکە دوسەد شەڕکەری تورك لەپشت سەری منەوەن و دەمەوێت شەڕیان لەگەڵ بکەم. خەڵك وەستان و ئەو هێرشی کردە سەر تورکەکان و شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و سەغدیەکان و فەرماندەی ئەوان و فەرماندەی تورکەکانی لەگەڵ حەوت پیاوی دیکە ئەسیر کرد و پاشماوەکان ڕێگەی خۆیان گرتەبەر. حومەید گەڕایەوە. زوبینێکیان بۆ هاویشت کە لەئەژنۆی چەقی و لەزیانەکەی ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

خەڵك تینو بوون. عەبدولرەحمانی عامری بیست مەشکە ئاوی باری وشترەکانی خۆی کردبو. کەم کەم دەرخواردی خەڵکیدا. موسلیم کوڕی سەعید داوای ئاوی کرد و جامێك ئاویان بۆ هێنا. جابر یا حارسە کوڕی کەسیر برای سلێمان کوڕی کەسیر ئاوەکەی لەدەمی گرتەوە. موسلیم وتی: وازی لێ بێنن چونکە ئەم کارەی نەکرد مەگەر ئەوەی داخێکی لەدڵدا بو. ڕۆشتنە خەجندە و خەڵك گرفتاری برسیەتی و زیان بون. خەڵك بلآوەیان لێکرد و بینیان دو سوارە بەدوای عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیمدا دەگەڕێن. ئەم دوانە فەرمانێکیان لەئەسەد کوڕی عەبداللە برای خالید کوڕی عەبداللەوە هێنابو کەوەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشانی کردبوو. عەبدولرەحمان نامەکەی بۆ موسلیم خوێندەوە کە وتی: فەرمانبەر و بیسەرین. عەبدولرەحمان یەکەم کەس بو کە لەدەشتی ئامۆل خێوەتی هەڵکرد.

خەزرەجی تەغلەبی دەڵێت: شەڕمان لەگەڵ تورکەکان کرد و ئەوان گەمارۆیان خستە سەر ئێمە بەشێوەیەك مەرگمان بەچاوی خۆمان بینی. حەوسەرە کوڕی یەزید کوڕی حوڕ کوڕی خونەیف لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر هێرشی کردە سەر تورکەکان و ماوەیەك لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و گەڕایەوە. نەصر کوڕی سەیار هاورێ لەگەڵ سی سوار هێرشی کردە سەر ئەوان و ئەوانی لەشوێنەکانیان دورخستەوە. خەڵك هێرشیان

کرد و تورکەکان و حەوسەرە شکستیان خوارد. ئەو برازای رەقبە کوڕی حوڕ بو.

دەڵێن: عومەر کوڕی هوبەیرە لەکاتی دەستنیشان کردنی موسلیم کوڕی سەعید وەك فەرماندار، پێی وت: دەبێت دەرگاوانەکەت لەباشترین موالیەکان بێت چونکە ئەو زمان و گوێی تۆیە، ئەرکی سەر شانی تۆیە کەیاریدەدەر و کارگوزارە بەخشراوەکان دەستنیشان بکەیت. وتی: ئەوانە کێن؟ وتی: بەخەڵکی هەر شارێك دەڵێیت کە فەرماندارەکەی خۆیان دەستنیشان بکەن، ئەگەر چاکەکار بێت لەبەرەژەوەندی تۆدایە و ئەگەر خراپەکار بێت، زیانەکەی بەوان دەگات و تۆ بەدور دەبێت و کەس سەرکۆنەت ناکات.

لەسەر مۆرەکەی موسلیم کوڕی سەعید (توبە بن ابی سعید) هەڵکەنرا بو. کاتێك ئەسەد کوڕی عەبداللە بوبە فەرمانداری خوراسان، ئەو نوەسراوەی لەسەر مۆڕەکەی خۆی هەڵکەند.

## حەج کردنی هوشام کوڕی عەبدولەلیك

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولەلیك حەجی کرد و ئەبو زەناد ئایینەکانی حەجی بۆ ئەو ئەنجامدا.

ئەبو زەناد دەڵێت: چاوم بەهوشام کەوت، لەناو هاوڕێکانی ئەودابوم کەسەعید کوڕی عەبداللە کوڕی وەلید کوڕی عوسمان کوڕی عەفان چاوی پێی کەوت. هاتە لایی و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خوا بەردەوام خۆشەویستی خۆی پێشکەش بەبنەماڵەی سەروەری باوەڕداران و بەردەوام هاوکاری جێگرە ستەم لێکراوەکانی کردوە و خەڵکان بەردەوام لەم شوێنەدا جوێن و نفرینی ئەبو تورابیان کردوە کە شوێنێکی پیرۆزە. شیاوە کە سەروەری باوەڕدارنیش سەرکۆنە و نفرینی بکات.

وتارەکەی لای هوشام پەسەند نەبو. وتی: بۆ جوێندان یا نفرین کردنی کەس نەهاتوم. بۆ حەج هاتوین. دواتر قسەکەی بڕی و روی کردە من و پرسیاری لەئایینەکانی حەج کرد. ئەوم لەنوسراوەکان ئاگادار کردەوە. دەڵێت: سەعید پێی ناخۆش بو من وتارەکەیم بیست، هەرکات کە منی دەبینی، سەری دادەخست.

## فەرمانداری ئەسەد لەخوراسان

دەڵێن: لەم ساڵەدا خالید کوڕی عەبداللە براکەی خۆی ئەسەد کوڕی عەبداللەی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کرد. ڕۆشتە ئەو سەرزەمینە و بیستی کەموسلیم کوڕی سەعید سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ فەرغانەیە. کاتێك ئەسەد گەیشتە روبار و مەبەستی پەڕینەوەی کرد، ئەشهەب کوڕی عوبەیدی تەمیمی کەسەرپەرەستی کاروباری دەریا لەئامول بو، ڕێگەی لێگرت و وتی: فەرمانیان بەمنداوە ڕێگە لەم کارە بگرم. ئەسەد زێڕ و زیوی پێبەخشی و ڕێزی لێگرت بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێگەی نەدا لەروبار تێپەڕێت. سەرئەنجام وتی: من فەرمانداری ئەم ناوچەم. دواتر ڕێگەی پێدا. ئەسەد وتی: روخساری ئەم پیاوە لەبیر نەکەن تا بۆ پاسەوانی کردنی لەئەمانەتی ئێمە، ڕێزی لێ بگرین.

دواتر روی کردە سەغدیەکان و لەمەرج دابەزی. فەرمانداری سەمەرقەند هانی کوڕی هانی بو. ئەو لەگەڵ خەڵك هاتەدەر تا چاوی بەئەسەد بکەوێت. ئەوی بینی لەسەر بەردێك دانیشتوە. خەڵك ئەم دیمەنەیان بەخراپ لێکدایەوە و وتیان: ناتوانین هیوای چاکەمان بەم پیاوە هەبێت، شێرێك لەسەر بەردێکە. ئەو ڕۆشتە ناو سەمەرقەند و دو پیاوی لەگەڵ فەرمانی فەرماندەیی عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیەم بۆ کاروباری تایبەت بەجەنگ رەوانە کرد. ئەم دوانە ڕۆشتنە ناو شار و بەدوایدا گەڕان و فەرمانەکەیان تەسلیم کرد. ئەو فەرمانەکەی بردە لای موسلیم و نیشانیدا. موسلیم وتی: فەرمانبەر و بیسەرین. عەبدولرەحمان هاورێ لەگەڵ خەڵکان و موسلیم گەڕایەوە و هەمویان لە سەمەرقەند ڕۆشتنە لای ئەسەد. ئەو هانی کوڕی هانی لەسەر کارەکەی لابرد و حەسەن کوڕی ئەبی عەمەرتەی کێندی لەجێگەکەی ئەو دانا.

بەحەسەنیان وت: تۆرکەکان بەحەوت هەزار شەڕکەر هێرشیان کردۆتە سەر تۆ. وتی: ئەوان بۆ شەڕی ئێمە نەهاتون، ئێمە هێرشمان کردە سەر وڵاتەکەی ئەوان و ئەوانمان کردە کۆیلەی خۆمان. لەگەڵ ئەمەیشدا، بێ گومان ئێوە لەیەك نزیك دەکەمەوە و تەوێلی ئەسپەکانی ئێوە لەتەوێڵی ئەسپەکانی ئەوان نزیك دەکەمەوە. دواتر جوێنی پێدان و نفرینی کردن. ئەوان هێرشیان برد و تەندروست گەڕانەوە. سابت کوڕی قەتنەی وەك جێگری خۆی لەسەمەرقەند دەستنیشان کرد. سابت وتارێکی پێشکەش

بەخەڵك كرد كەزمانی گیرا و وتی: من یطع الله و رسوله فقد ضل ( هەركەس فەرمانبەری خواوەند و نێردراوەكەی بكات، بەراستی كەوتۆتە ناو گومراییەكەی سەختەوە) دەبوایەست ئەم ئایە بخوێنێتەوە: من یطع الله و رسوله فقد فاز فوزا عظیما (هەركەس فەرمانبەری خواوەند و پێغەمبەرەكەی بكات، بەراستی بەشێوەیەكی سەیر رزگاری بوە (ئەحزاب/ ٧١/٣٣). بێدەنگ بو و هیچ وشەیەكی نەهێنایە سەرزمان. دواتر وتی:

ان لم اكن فیكم خطیبا فاننی بسیفی اذا حد الوغی لخطیب

یانی: ئەگەر لەناو ئێوەدا وتاردەرێكی زمان پاراو نەبوم، لەرۆژی شەڕ كەئاگری كینە بڵێسە دەسەنێت، شمشێرەكەم وتاردەرێكی زمان شیرینە.

پێیان وت: ئەگەر لەسەر تەختی وتاردان ئەمەت دەوت، یەكێك دەبویت لەزمان پاراوترین وتاردەران. حاجب كوڕی فیلی پەشكری زمانی بۆ سەركۆنە كردنی ئەو كردەوە و سەبارەت بەزمان گیرانی ئەو وتی:

ابا العلاء لقد لاقیت معضلة یوم العروبة من كرب و تخنیق

تلوی اللسان اذا رمت الكلام به كما هوی زلق من شاهق النیق

لما رمتك عیون الناس صاحیة انشات نجرض لما قمت بالریق

اما القران فلا تهدی لمحكمة من القران و لا تهدی لتوفیق

یانی: ئەی باوكی عەلا ء، روبەروی دژواریەكی ریسواكەر بویتەوە و رۆژی نیشاندانی پیاوەتی، بەزمانی شیرینی عەرەبی، گرفتاری خەم و خەفەبون بویت، كاتێك مەبەستی ئەوەت كرد قسە بكەیت، زمانت گیرا و هەڵەت كرد بەهەمان شێوە كەتاشە بەردێكی خلیس و خڕ لەلوتكەی كێوێكەوە بۆ ناو دۆڵێك خل ببێتەوە. كاتێك چاوەكانی هاواركەری خەڵكان سەیری تۆیان دەكرد، دەستت بەهەڵیت و پڵیت كرد و بەردەوام ئاوی دەمت قوت دەدا (یا نانی بەیانیت نەخوارد و وتاردانت دەست پێكرد). بەڵام لەقورئان، هیچ نیشانەیەكی بەهێز نازانیت و بۆ هیچ رێگەیەكی رزگاری رێنوێنی ناكرێیت.

## دەست نیشان کردنی حوڕ لەموسڵ

لەم ساڵەدا، هوشام، حوڕ کوڕی یوسف کوڕی یەحیا کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی ئەلعاص کوڕی ئومەییەی وەك فەرمانداری موسڵ دەستنیشان کرد. ئەو کەسە بوو کە(المنقوشه) (نەخشێنراو)ی وەك کۆشکی فەرمانڕەوایی خۆی هەڵبژارد. بۆیە پێیان دەوت نەخشێنراو چونکە بەجۆرەکانی گەوهەرە رەنگاورەنگەکان نەخشێنرا بو. ئەم کۆشکە لەنزیك بازاری کۆپان دورەکان و چوارشەممە بازار بو. ئێستاکە بۆتە وێرانەیەك لەنزیکی چوارشەممە بازار. حوڕ کوڕی یوسف ئەو کەسەیە روبارێکی لەموسڵ هەڵکەند و ئاوی تێکرد.

مەبەستی لەم کارە ئەوە بو کەبینی ژنێك گۆزەیەك ئاوی لەسەر شانە، چەند هەنگاوێك بەرێدا دەڕوات و دواتر دایدەنێت و دەحەسێتەوە تا چارەسەری رێگە دورەکە بکات. سەبارەت بەم کارە نامەی بۆ هوشام نوسی و ئەو فەرمانی پێدا روبارێك بەناوەڕاستی شارەکەدا هەڵکەنێت. حوڕ ئەو کارەی کرد و لەوە بەدوا بەشی هەرە زۆری ئاوی خواردنەوەی خەڵکەکە لەروبارەکە وەردەگیرا. (شەقامی روبار) لەسەر روبارەکە بو. هەڵکەندنەکەی چەندین ساڵی خایاند و حوڕ لەساڵی ١١٣/ ٧٣١ زایینی کۆچی دوایی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا، ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە، لەجێگەی (حجر) لەگەڵ هوشام کوڕی عەبدولمەلیك قسەی کرد. پێی وت: تۆ بە رێزی ئەم ماڵە بەرێزە کە بۆ رێز گرتن لەو هاتویت، سوێند دەدەم کە سامانە بەستەم وەرگیراوەکەم بۆ من بگەرێنیتەوە. وتی: کام ستەمە؟ وتی: ماڵەکەم. وتی: بۆ لەگەڵ سەروەری باوەڕداران عەبدولمەلیك باست نەکرد؟ وتی: ستەمی لەمن کرد. وتی: ئەی وەلید و سلێمان؟ وتی: هەردوکیان ستەمیان لێکردم. وتی: عومەر کوڕی عەبدولعەزیز؟ وتی: خوا لێی خۆش بێت، بۆ منی گەڕاندەوە. وتی: یەزید کوڕی عەبدولمەلیك؟ ئیبراهیم وتی: ستەمی لێکردم و دوای ئەوەی وەرم گرتوە، دوبارە لێی سەندمەوە و ئێستاکە لەدەستی تۆدایە. وتی: ئەگەر شوێن بۆ لێدان دەبو، لێم دەدایت. وتی: دەتوانی بەمشمشێر و قامچی لەمن بدەیت. وتی: توانای شمشێر وقامچی لێدانم هەیە. هوشام بەرێکەوت و ئەبرەش بەدوای ئەو. هوشام وتی: باوکی

موجاشیع، قسەکانی ئەم پیاوەت چۆن بینی؟ وتی: چەندە شیرین بو! هوشام وتی: قورەیشیەکان و زمان پاراوی ئەوان بەم شێوەیە. تا ئەو کاتەی کەسانی لەم شێوە لەناو ئەم خەلکانەدا بن، بەردەوام دەتوانین بەوان هیوادار بین..

لەم ساڵەدا هوشام، عەبدولواحیدی نەزری لەفەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف دورخستەوە و خاڵی خۆی ئیبراهیم کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیلی بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرد و ئەو لەجەمادی الثانی / نۆڤەمبەری ٧٢٤ زایینی ڕۆشتنە ناو ئەو شارە. فەرمانڕەوایی نەزر یەك ساڵ و هەشت مانگ درێژەی کێشا.

هەروەها لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عەبدولمەلیك، شەری هاوینەی کرد و جەراح کوڕی عەبدالله لەسەرزەمینی لان شەڕی کرد. دواتر لەگەڵ خەڵکەکەی ئاشتی کرد و ئەوان باجیاندا.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی رەجەب/ دێسامبەری ٧٢٤ زایینی عەبدولصەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی هوشام داوای لەمحەممەد کوڕی صەفوانی جومەحی کرد تا ببێتە داوەری داوەرەکانی مەدینە. دواتر ئەوی لابرد و صەلتی کێندی بۆ ئەم کارە دەستنیشان کرد.

فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف ئیبراهیم کوڕی هوشامی مەخزومی بو، فەرمانداری عێراق و خوراسان خالید کوڕی عەبداللەی قەسری بەجلی، نوێنەری خالید بۆ نوێژی بەسرە عوقبە کوڕی عەبدولعەلی، فەرماندەی پاسەوانەکانی مالك کوڕی مونزەر کوڕی جارود و سەرپەرەستی دامەزراوی داد سومامە کوڕی عەبدالله کوڕی ئەنس بو.

لەم ساڵەدا هوشام لەگەڵ خەڵك ئایینی حەجی ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی مالك موالی حەزرەمیەکان و بەکر کوڕی عەبدالله مەزنی مردن.

## رووداوەکانی ساڵی سەد و حەوتی کۆچی ( ٧٢٥ زایینی )

## پاشایەتی جونەید بەسەر چەندین ناوچە لە پانتاییەکانی سندو کوژرانی جەیشەبەی پاشا

لەم ساڵەدا خالیدی قەسری، جونەید کوڕی عەبدولرەحمانی وەك فەرمانداری سند دەستنیشان کرد. ئەو لەکەنارەکانی روباری مێهران دابەزی بەڵام جەیشەبە کوڕی زاهیر رێگەی پەڕینەوەی پێنەدا. وتی: ئێمە موسوڵمانین و پیاوی چاکەکار (عومەر کوڕی عەبدولعەزیز) منی بۆ ئەم کارە راسپاردوە و من بەفەرمانی ئەو پاشایی ئەم سەرزەمینەم و لەتۆ دڵنیا نیم. بارمتەی پێدا و بارمتەی لێوەرگرت لەسەر ئەو بنەمای گەباجی وڵاتەکەی بدات. دواتر بارمتەکانیان گەڕاندەوە و جەیشەبە لەدین هەڵگەڕایەوە و شەڕی دەستپێکرد. دەستەیەك دەڵێن: شەڕی نەکرد بەڵکو جونەید ستەمی لێکرد وجەیشەبە هاتە هند و هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و کەشتیەکانی تەیار و خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. جونەیەدیش بەکەشتیەکان بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت. روبەروی یەك بونەوە و جەیشەبە بەدیلی گیرا و کەشتیەکانی لەقوڕ چەقین و جونەید ئەوی کوشت. براکەی صەصە بۆ عێراق هەڵات تا لەپەیمان شکێنی جونەیەد سکاڵا لای داوەر تۆمار بکات بەڵام جونەید فریویدا و بۆ ناو سوپاکەی خۆی بانگێشتی کرد و دواتر خوێنی ڕشت.

جونەید بۆ شەڕی کیرج ڕۆشت و بەزۆری شمشێر دەستی بەسەردا گرت و ئوزیەن و مالبەی (مالیەی) گرت. هەروەها چەندین ناوچەی دیکەی لەو سەرزەمینە خستە سەر سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی.

## شەڕی عەنبەسە لەگەڵ فەرەنگەکان لە ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عەنبەسە کوڕی سوحەیمی کەلبی کارگوزاری ئاندۆلۆس لەگەڵ خەڵکانێکی فراوان شەڕی لەوڵاتە فەرەنگیەکان دەست پێکرد و لەگەڵ شاری کارکاسۆن (لەفەرەنسا) شەڕی کرد و گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی. لەگەڵ ئەو ئاشتیان کرد لەسەر ئەو بنەمای کەنیوەی سەرزەمینی موالیەکان بەو بسپێرن و هەمو سامان و ئەسیرەکانی

موسوڵمانان لەو شارە بۆ ئەو بگەڕێننەوە، باج بدەن و پێبەندی ئاینی ئەمان بەخشراوەکان بن بەو شێوەکە لەگەڵ دۆستی موسوڵمانەکان دۆستایەتی ولەگەڵ دوژمنەکانیان دوژمنایەتی بکەن. عەنبەسە گەڕایەوە و لەشەعبانی ١٠٧/ دێسامبەری ٧٢٥ زایینی مرد. ماوەی فەرمانداریەکەی چوارساڵ و چوار مانگی خایاند. کاتێك مرد، بشر کوڕی صەفوان کوڕی یەحیا کوڕی سەلەی کەلبی وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان کرا و ئەویش لە زی قەعدەی ئەم ساڵە/ مارسی ٧٢٦ زایینی ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

## بانگەوازی بەنی عەباس

لەم ساڵەدا بوکەیر کوڕی ماهان، ئەبو عێکرەمە و ئەبو محەممەد صادق و محەممەد کوڕی خونەیس و عەماری عیبادی و زیاد خاڵی وەلیدی ئەزرەق لەگەڵ دەستەیەك لەشوێنەکەوتەکانی وەك مژدەدەر و بانگەشەکەر بۆ خوراسان ڕەوانە کرد. پیاوێك لەکێندە ڕۆشتە لای ئەسەد کوڕی عەبداللە و لەزیانی ئەوان دوزمانی کرد. ئەبو عێکرەمە، محەممەد کوڕی خونەیس و هەمو کەسەکانی دیکەیان گرت و عەمار رزگاری بوو. ئەسەد هەر کەسێکی گرت، دەستی بڕی و دواتر لەداریدا. عەمار بۆ لای بوکەیر کوڕی ماهان گەڕایەوە و لە بەسەرهاتەکە ئاگاداری کردەوە. ئەم هەواڵەی بۆ محەممەد کوڕی عەلی نوسی کە لەوەڵامدا بۆی نوسی: سوپاس بۆ خوا کەبانگەوازەکەی ئێوەی بەهێز کرد و وەسفی وتارەکەتانی کرد. لەناو ئێوەدا کەسانێك بۆ کوژران ماون کەبەم زوانە گیان دەبەخشن.

## ڕوداوەکانیتر

لەم ساڵەدا موسلیم کوڕی سەعید ڕۆشتە لای خالید کوڕی عەبداللە. لەخوراسان ڕێزی لێدەگرت و کاری بەکارەکانی نەبوو. موسلیم هات و بینی کوڕی هوبەیرە دەیەوێت هەڵبێت. ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت و وتی: ئەم خەڵکە، لەوەی سەبارەت بەوان، بیری لێدەکەنەوە، سەبارەت بەئێوە باشتر بیر دەکەنەوە.

لەم ساڵەدا ئەسەد بۆ شەڕی ئەمرون پاشای کوێستانەکانی غەرچە (غەرشیستان) لەنزیکی تاڵەقان بەرێکەوت. ئەمرون لەسەر دەستی ئەو باوەڕی بەئیسلام هێنا. لەئێستادا فەرمانڕەوایەتی یەمەن دەکەن.

## شەڕی غور

لەم ساڵەدا ئەسەد بۆ شەڕی غور (کوێستانەکانی هەرات) بەڕێکەوت. خەڵکەکەی دارایی و گەنج و زێڕ و زیو و باروبنەی خۆیان بردە ناو ئەشکەوتێك کە هیچ ڕێگەیەکی نەبو. ئەسەد گەنجینەکانی دروست کرد و پیاوەکانی لەناو ئەواندا جێگیر و بەزنجیرەکان بۆ بەرزایی کوێستانەکانی ڕەوانە کردن کە ئەوەی توانیان هەڵیان گرت و هێنایان.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

لەم ساڵەدا، هوشام، جەراح کوڕی عەبدالله حەکەمی لەفەرمانداری ئەرمەنستان و ئازەربایەجان لابرد و براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیکی بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرد و مەسلەمە فەرماندەیی بەحارس کوڕی عەمرۆ تایی بەخشی کە دەستی بەسەر چەندین شار و گونددا گرت و بیرەوەرییەکی چاکی لەخۆی بە جێهێشت.

لەم ساڵەدا، ئەسەد سوپا نیشتەجێکەی بروقانی بۆ بەلْخ برد و هەر کەسێك بەئەندازەی شوێنی مانەوەی خۆی زەوی پێ بەخشرا و ئەوانەی شوێنیان نەبو، ماڵی پێدان و مەبەستی ئەوەی کرد لەسەر بنەمای پێنج یەك پێگەیان پێ ببەخشێت بەلام پێیان وت کەئەوان بۆ وەرگرتنی سامان و لەپێشی سەختگیرن، لەبەر ئەمە ئەوانی تێکەلاو کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبو خالید کوڕی بەرمەك دەستی بەبناغە داڕشتنی شاری بەلخی بەرمەك کرد. دورییەکەی لە بروقانەوە دو فەرسەخ بو.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی هوشام ئاییتی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزاری شارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشو بون کە پێشتر ئاماژەیان پێدرا.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی یەسار لەتەمەنی ٧٣ ساڵی و عەتا کوڕی یەزیدی لەیسی لەتەمەنی ٩٨ ساڵی مردن. مەرگی عەتا لە ساڵی ١٠٥/ ٧٢٣ زایینی ئاماژەی پێدرا.

## ڕوداوەکانی ساڵی سەد و هەشتی کۆچی ( ٧٢٦ زایینی )

## شەڕ لەگەڵ خوتەل و غور

دەڵێن: لەم ساڵەدا ئەسەد لەروبار پەڕیەوە و خاقان روبەروی بویەوە بەلآم شەڕیان نەکرد. دەستەیەك دەڵێن: شکستی خوارد و گەڕایەوە. ئەسەد پێشتر وای نیشاندابو کەدەیەوێت زستان لەدۆڵی سور بەسەر ببات. فەرمانی کۆچ کردنی بەخەڵکدا. ئالآکانی هەڵکرد و لەشەوێکی تاریك بەرەو دۆڵی سور بەرێکەوت. خەڵك تەکبیریان وت. پرسی: ئەوان چیان بەسەر هاتوە؟ وتیان: ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەخەڵك گەڕاونەتەوە. فەرمانی بەجارچیەکەی خۆیدا: جار بدە کە فەرماندار مەبەستی غوریەکانی هەیە. بەرەو لای ئەوان پێشڕەوی کرد و شەڕی لەگەڵ کردن و بۆ ماوەی یەك رۆژ هەوڵیدا و خەڵکان لەبەرابەر ئەو خۆڕاگریان کرد. پیاوێك لەبت پەرستەکان لەنێوان دو ریزەکە دەرکەوت. سالم کوڕی ئەحوەز بەنەصر کوڕی سەیاری وت: من هێرش دەکەمە سەر ئەم پیاوە گەردن درێژە ئەگەری هەیە بتوانم بیکوژم و ئەسەد رازی بکەم. هێرشی کرد و بە ڕم لێیدا و کوشتی. گەڕایەوە و بەنەصری وت: دوبارە هێرش دەبەم. هێرشی برد و پیاوێکی دیکەی کوشت و بریندار بو و نەصر بەسالمی وت: لە شوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە تا من هێرش بەرم. ڕۆشت و پەلاماری دوژمنیدا، تەپ و تۆزی بەرز کردەوە و دو پیاوی کوشت و بریندار بۆ ناو سوپاکەی خۆی هەلآت. دواتر وتی: گومان دەکەی، ئەوەی کردمان ئەوی رازی کردبێت؟ خوا رازی نەکات! وتی: نا، سوێند بەخوا. دەڵێت: نێردراوی ئەسەد هاتە لای ئەم دوانە و وتی: فەرماندار دەڵێت: جێگە و پێگەی ئێوە دوانەم بینی و نیازی کەمی ئێوەم بەموسوڵمانان هەست پێکرد، خوا نفرینی هەردوکتان بکات! وتی: ئەگەر جارێکی دیکە ئەو کارە بکەین، خوا ریسوامان بکات، ریسوامان بکات. لەیەك جیا بونەوە.

بەیانی ئەو رۆژە مەبەستی شەڕیان کرد و شەڕیان کرد و بتپەرستەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان دەستیان بەسەر لەشکرگەکە و سەرزەمینەکانی ئەواندا گرت. چەندین ئەسیریان کەوتە بەردەست و تالآنیەکی زۆریان کۆکردەوە. خەڵك برسیەتی

تەنگی پێ هەڵچنیبون و لە خوتەل ناتەوانی زەختی لێدەکردن. ئەسەد دو بەرخی بەکۆیلەکەی خۆی نارد و وتی: ئەم دوانە بە پێنسەد درەم بفرۆشە. کاتێك کۆیلە بەرێکەوت، ئەسەد وتی: جگە لەکوڕی شەخیر (کە لەناو شەرکەراندا بو) کەس ئەمە ناگرێت. کاتی شەو، ڕۆشتە بازار و دو بەرخەکەی بینی و بەپێنسەد درەم کڕی، یەکیانی سەر بری و یەکیانی بۆ براکەی ڕەوانە کرد. کاتێك ئەو کۆیلە ئەسەدی ئاگادار کردەوە، هەزار درەمی بۆ کوڕی شەخیر ڕەوانە کرد. ئەمە ناوەکەیەتی: ئەبو موتەریف عوسمان کوڕی عەبداللە کوڕی شەخیر.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەسەرزەمینی جەزیرە شەڕی ڕۆمیەکانی کرد و دەستی بەسەر کالیسێریدا (قەیساریە) گرت کە شارێکی بەناوبانگ بو. هەروەها لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی هوشام دەستی بەسەر چەندین قەڵای ڕۆمیدا گرت.

لەم ساڵەدا بوکەیر کوڕی ماهان دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کوڕی عەباس و لەناو ئەوان عەماری عیبادی بۆ خوراسان ڕەوانە کرد. پیاوێك لەزیانی ئەوان لای ئەسەد کوڕی عەبداللە دوزمانی کرد. ئەسەد عەماری گرت و هەردودەست و هەردو قاچی بڕیەوە و هاوەڵانی ڕزگاریان بوو و بۆ لای بوکەیر گەڕانەوە و ئەویان لەڕوداوەکە ئاگادار کردەوە. بوکەیر هەواڵەکەی بۆ محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عەباس نوسی کە وەڵامی دایەوە: سوپاس بۆ خوا کە بانگەوازەکەی ئێوەی بەهێز و شوێنکەوتەکانی ئێوەی ڕزگار کرد. لەگێڕانەوەی ڕوداوەکانی ساڵی ١٠٧/ ٧٢٥ زایینی ئاماژەمان بەم داستانەدا. لەوێدا وتمان کە عەمار ڕزگاری بو. لێرەدا دەڵێین کە ئەندامەکانی ئەویان بڕیەوە. لەبەر ئەمە دوبارە ئاماژەمان پێدا و خوا زاناترە.

هەروەها لەم ساڵەدا ئاگرکەوتنەوەیەك لەدابق ڕویدا و کشتوکاڵ و مەڕوماڵات و باروبنەی خەڵکی هەڵلوشی.

لەم ساڵەدا کوڕی خاقان پاشای تورکەکان بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوت و لەو سەرزەمینە گەمارۆی خستە سەر چەندین شار. حارس کوڕی عەمرۆی تایی ڕوبەڕوی

بویەوە کەشەڕیان دەست پێکرد و تورکەکان شکستیان خوارد. حارس شوێنیان کەوت تا لەڕوباری ئەرەس پەڕینەوە. کوڕی خاقان گەڕایەوە و سەر لەنوێ شەڕی دەست پێکرد. کوڕی خاقان شکستی خوارد و دەستەیەکی زۆر لەتورکەکان کوشتار کران.

## شۆڕشی عەبادی روعەینی لەیەمەن

لەم ساڵەدا عەبادی روعەینی لەیەمەن ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد و دروشمی خەواریجی بەرز کردەوە: فەرمانڕەوایی و داوەری تایبەتە بەخوا. فەرمانداری یەمەن یوسف کوڕی عومەر ئەو و سێسەد کەس لە شوێنکەوتەکانی سەر بڕی.

## رووداوەکانیتر

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولەلیك کوڕی مەروان هاوڕێ لەگەڵ مەیمون کوڕی مێهران لەگەڵ شامیەکان بۆ شەڕ بەرێکەوت. دەریایان بڕی و خۆیان گەیاندە قیبرس. مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك لەوشکانیدا شەڕی کرد.

لەم ساڵەدا تاعونێکی مەترسیدار لەشام سەری هەڵدا.

ئیبراهیم کوڕی هوشام فەرمانداری مەککە ئاینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

کارگوزاران هەمان کەسان بون کە لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی پێش ئاماژەیان پێدرا.

لەم ساڵەدا ئەم کەسانە مردن: محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی کە دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١١٧/ ٧٣٥ زایینی مرد. ئەو لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بو، موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدالله باوکی عیسا کوڕی موسا لەکاتی شەڕ لەسەرزەمینی رۆم لەتەمەنی ٧٧ ساڵی، قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری صدیق لە ٧٠ یا ٧٢ ساڵی کە لەکۆتاییەکانی ژیانی سۆمای چاوەکانی لەدەستدا و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٠١/ ٧١٩ زایینی کۆچی دوایی کرد. ئەبو متوەکیل عەلی کوڕی داوودی ناجی، ئەبو صدیقی ناجی کەناوی بەکر کوڕی قەیسی ناجیە، ئەبو نەزرە مونزەر کوڕی مالك کوڕی قیتعەی نەزری و موحاریب کوڕی دیساری کوفی سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە.

## ڕوداوەکانی ساڵی سەد و نۆی کۆچی ( ٧٢٧ زایینی )

## لەسەرکار لابرانی ئەسەد و براکانی لە فەرمانداری خوراسان و فەرمانڕەوایی ئەشرەس

دەڵێن: لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولەلیك، خالید کوڕی عەبدالله و براکەی ئەسەد کوڕی عەبداللەی لەفەرمانڕەوایی خوراسان دورخستەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کەئەسەد کەسێکی دەمارگیر و سەختگیر و زیانی لەخەڵك دەدا و ئەوانی ڕەنجاند و نەصر کوڕی یەسار وچەندین کەسی قامچی باران کرد و لەناو ئەوان: عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم، سورە کوڕی حوڕ، بەختەری کوڕی ئەبی درهەم و عامر کوڕی مالکی حیمانی. سەر و ریشی ئەوانی تاشی و ئەوانی بۆ لای خالیدی برای ڕەوانە کرد و بۆی نوسی: ئەوان مەبەستی شۆڕشیان کردوە.

کاتێك گەیشتنە لای خالید، سەرکۆنەی ئەسەدی کرد و جوێنی پێدا و وتی: بۆ سەری بڕاوی ئەوانی بۆ نەناردم؟ نەصر وتی:

بعثت بالعتاب فی غیر ذنب    فی کتاب تلوم ام تمیم

ان اکن موثقا اسیرا لدیهم    فی هموم و کربة و سهوم

رهن قسر فما و جدت بلاء    کاسار الکرام عند اللئیم

ابلغ المدعین قسرا و قسر    اهل عود القناة ذات الوصوم

هل قطعتم عن الخیانة و الغد    رام انتم کالحا کر المستدیم

یانی: نیگاری نازەنینم، ئەی تەمیم، بێ ئەوەی گوناحێکم کردبێت، نامەی نوسی و سەرکۆنەی کردم. ئەگەر لەناو ئەوان ئەسیر و گرفتاری دەرد و ڕەنج و خەم و بارمتەیەك لای (قسر)بم هەرگیز ئازارێکی گیانبڕتر لەگرفتاری ڕێزدارانم لەدەستی کەسانی پەست و ریسوا نەبینیوە و نەبیستوە. بەداعیەداران یانی قسر پەیامی من بگەیێنە و قسر ڕمێکی گرێ لەناو گرێی هەیە، ئایا دەستتان لەخیانەت و فریوکاری هەڵگرت یا ئێستایش بەردەوام ستەمکار و ستەمگەرن؟

فەرزدق وتی:

اخالد لو لا الله لم تعط طاعة ولو لابنو مروان لم توثقوا نصرا

اذا للقيتم عند شد وثاقة بنى الحرب لا كشف اللقاء و لا ضجرا

یانی:ئەی خالید، ئەگەر لەژێر ناوی خوادا نەدەبو، ئێوەی عەرەب نەدەبونە فەرمانرەوایی خەڵکە پێشکەوتومکەی جیهان و ئەگەر زۆری مەروانیەکان نەدەبو، بەنی نەصرتان گرفتار و بەند نەدەکرد. ئەوسا لەکاتی توند بەستنەوەی ئەو، روبەروی ئەو شەڕکەرانە دەبونەوە کە نەدەتوانرا شەڕکەرانی ئەوان لەناو ببەیت و نە ئەوان خۆیان لەشەڕ بێزار دەبون.

رۆژێك ئەسەد لەناو خەڵکان وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: خوا رووی هەموتان رەش بکات! خاوەنانی خراپەکاری و دوورویی و ئاژاوە و زیان گەیاندن! خوایە، لەنێوان من و ئەوان جیایی دروست بکە و من بۆ زادگا و وڵاتەکەی خۆم بگەرێنەرەوە.

هوشام کوڕی عەبدولەلیکیان لەکردارەکانی ئەو ئاگادار کردەوە. نامەی بۆ خالید نوسی: براکەت لەسەر کار لاببە. ئەوی لەسەر کار لابرد. ئەو لەمانگی رەمەزانی ساڵی ١٠٩/ ژانویەی ٧٢٨ زایینی بۆ عێراق گەڕایەوە. حەکەم کوڕی عەوانەی کەلبی کردە فەرمانداری خوراسان و ئەو شەرێکی هاوینەی پشت گوێ خست و شەڕی نەکرد. دواتر هوشام، ئەشرەس کوڕی عەبداللە سولەمی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدا نامە بۆ خالید بنوسێت. ئەشرەس پیاوێکی زانا و چاکەکار بو. لەبەر ئەمە بە فرەزان (کامل) ناویان دەبرد. کاتێك گەیشتە خوراسان، خەڵك لەهاتنی ئەو شادمان بون. سەرەتا ئەبو مونازلی کێندی کردە سەرپەرەستی دامەزراوەی داد و دواتر ئەوی لەسەر کار لابرد و محەممەد کوڕی یەزیدی کردە دادیار.

## بانگەشەکەرانی بەنی عەباس

دەڵێن: یەکەم کەس لەبانگەشەکەرانی بەنی عەباس کە گەیشتە خوراسان، ئەبو محەممەد زیاد موالی بەنی هەمدان لەسەردەمی فەرمانداری ئەسەد بو. محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدالله کوڕی عەباس ئەوی ڕەوانە کرد و پێی وت: لەناو خەڵکانی یەمەنی دابەزە و لەگەڵ موزەریەکان بەمیهرەبانی هەڵس و کەوت بکە و خۆت لەو پیاوە نەیشابورییە (بەناوی غالب کە شەیدای منداڵەکانی فاتیمە بو) بەدور بگرە. دەستەیەك دەڵێن: یەکەم کەس کە نامەی محەممەد کوڕی عەلی بردە خوراسان، عەلی کوڕی حەرب کوڕی عوسمان موالی بەنی قەیس کوڕی سەعلەبە لەخەڵکی بەلخ بو. کاتێك زیاد گەیشتە خوراسان، پێشنیاری فەرمانبەری لەکوڕی عەباسی پێکردن و کردار و ستەمکاری ئومەوییەکانی بیرخستنەوە و میوانداری چەندین کەسی کرد و خواردنی پێدان. غالب ڕۆشتە لای ئەو و ئەم دوانە سەبارەت بە لەپێشی بنەماڵەی عەلی یا بەنی عەباس گفتوگۆیان کرد و شەڕ لەنێوانیان دروست بو و لەیەك جیابونەوە. زیاد زستانێکی لەمەرو بەسەر برد. لەخەڵکەکەی ئەوێ یەحیا کوڕی عوقەیلی خوزاعی و کەسانیتر هاتوچۆیان دەکرد.

ئەسەدیان لەم کارە ئاگادار کردەوە. ئەوی بانگ کرد وپێی وت: ئەم هەواڵانەی لەتۆوە بەمن دەگات، چین؟ وتی: درۆیە. من بۆ بازرگانی هاتوم و سامانی خۆم لەناو خەڵکاندا بڵاو کردۆتەوە و کاتێك سامانەکەم کۆبکەمەوە، ئەم شارە بەجێ دێڵم. ئەسەد پێی وت: لەولاتەکەی من بڕۆدەر. گەڕایەوە و دوبارە سەرقاڵی کارەکەی بو. دوبارە ئەسەدیان ئاگادار کردەوە و ئەویان لەو ترساند. ئەسەد ئەو و هاوڕێکانی بانگ کرد و هەموویانی کوشت کە پانزە کەس لەخەڵکانی کوفە بون جگە لەدو منداڵی کەم تەمەن کەئەوانی ئازاد کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبو بەڵکو فەرمانیدا کە بەشمشێر بیکەن بەدو کەرتەوە. شمشێریان لێدا بەڵام کاریگەر نەبو و خەڵك تەکبیریان وت. ئەسەد پرسی: ئەمە چیە؟ وتیان: شمشێر کاریگەری لەسەر دانەنا. جارێکی دیکە لێیاندا و شمشێرەکە گەڕایەوە. بۆ جاری سێیەم لێیاندا و کردیان بەدوکەرت. پیشنیاری بەیارانی

کرد لەباوەڕی خۆیان و شوێنکەوتنی عەباسیەکان بێزاری خۆیان دەربڕن. هەرکەس بێزاری دەربڕی، ئازادی کرد. دو کەس بێزاریان دەربڕی و ئازاد بون و هەشت کەس بەو کارە رازی نەبون و کوژران.

کاتێك بەیانی بەیانی داهات، یەکێك لەو دوانە هاتە لای ئەسەد و وتی: من پەیوەستی هاورێکانم بکە. ئەسەد ئەوی سەر بڕی. ئەم رووداوە چوار رۆژ پێش جەژنی (قوربانی کردنی مەڕ) بو (ئەم جەژنە لەدەی زی حەججەدایە و چوار رۆژ پێش ئەوە دەبێتە شەشی زیحەججە/ ٢٣ مارسی ٧٢٨ زایینی) دوای ئەوان، پیاوێك بەناوی کەسیر لەکوفەوە هات و وەك میوان رۆشتە لای ئەبو نەجم. ئەو کەسانەی چاویان بەزیاد کەوتبو، هاتوچۆیان دەکرد. یەك یا دو ساڵ بەم شێوەیە مایەوە. پیاوێکی فرەزان نەبو. خەداش (ناوی عەمارە بو) هات و بەسەر کەسیردا زاڵبو.

گێرانەوەیەکی دیکەیان سەبارەت بەبانگەشەکەران بۆ بەنی عەباس گێڕاوەتەوە کە ئاماژەمان پێدا.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی عوقبەی فێهری لەدەریا شەڕی کرد و معاویە کوڕی هوشام لەسەرزەمینی رۆم و قەڵای تیبەی گرت. دەستەیەك لەخەڵکی ئانتیوخیا (ئەنتاکیە) لەهاورێیەتی ئەو گرفتار بون (کوژران یا بریندار بون)

لەم ساڵەدا مالك کوڕی مونزەر کوڕی جارود، عومەر کوڕی یەزیدی ئوسیەدی کوشت. هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بو کە ئەو لەشەڕ دژی یەزید کوڕی موهەلیب هەوڵیدەدا و یەزید کوڕی عەبدولەلیك کوڕی مەروان وتی: ئەمە تاقە پیاوی عێراقە. ئەم کارە لای خالید کوڕی عەبداللە گران بو. خالید بەمالك کوڕی مونزەر، سەرپەرەستی پاسەوانەکانی بەسرە فەرمانیدا کە رێزی لێبگرێت و سەرپێچی فەرمانەکانی نەکات. بیری لەوە کردەوە کە لەدەرفەتێکی گونجاودا دەستی پێی بگات یا بیانوێك بەدەست بێنێت و خوێنی برێژێت. مالك کوڕی مونزەر ئاماژەی بە عەبدوالعەلی کوڕی عەبداللە کوڕی عامردا و درۆی بەدەمەوە هەڵبەست. عومەر کوڕی یەزید وتی: بۆ کەسێکی وەك عەبدولعەلی درۆ هەڵمەبەستە. مالك بەتوندی هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد و بەقامچی ئەوی لەناو برد.

## درێژەی ڕوداوەکان

ﻫ

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەپانتاییەکانی ئازەربایەجان لەگەڵ تورکەکان شەڕی کرد و تالآنی کۆکردەوە و خەڵکانی ئەسیر کرد و تەندروست گەڕایەوە.

لەم ساڵەد ئیبراهیم کوڕی هوشام ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا و وتارێکی بۆ خوێندنەوە و وتی: پرسیار لەمن بکەن چونکە کەس لەمن بە فرەزانتر نابینن. پیاوێك سەبارەت بە (اضحیە) پرسیاری لێکرد کە پێویستە یا شیاو (فەرزە یا نە). ئیبراهیم وەڵامەکەی نەزانی، هیچی نەوت و لەسەر تەختی وتاردان هاتەخوار. ئەو فەرماندری مەککە و مەدینە و تایف بو، خالید کوڕی عەبداللە قەسری فەرمانداری کوفە و بەسرە کەبۆ نوێژی بەسرە ئەبان کوڕی صەبارەی یەسربی دەستنیشان کردبو و فەرماندەیی پاسەوانەکانی بە بیلال کوڕی ئەبی بودرە سپاردبو. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بە عەبداللە کوڕی ئەنس دابو. فەرمانداری خوراسان ئەشرەس بو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەبو مێجلەز لاحق کوڕی حومەیەدی بەسری، بشر کوڕی صەفوان فەرمانداری ئەفریقیە کە لەدورگەی سیسیل شەڕی کرد و تالآنی زۆری دەست کەوت و بۆ کایرەوان (قیرەوان) گەڕایەوە و لەوێ مرد و هوشام دوای ئەو عوبەیدە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی ئەغەری سولەمی لەجێگەکەی دانا کە ئەو عوبەیدە کوڕی یەحیا کوڕی سەلەمەی کەلبی لەفەرمانداری ئاندۆلۆس لابرد و حوزەیفە کوڕی ئەحوەصی ئەشجەعی هێنایە سەر کار و لەمانگی ڕەبیع الاولی ساڵی ١١٠/ ژوئەنی ٧٢٨ زایینی گەیشتە ئاندۆلۆس و شەش مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد و دواتر لەسەر کار لابرا و عوسمان کوڕی ئەبی نەسعەی خەسعەمی جێگەی ئەوی گرتەوە.

## رووداوەکانی ساڵی سەد و دەی کۆچی ( ٧٢٨ زایینی )

## هەڵس وکەوتی ئەشرەس لەگەڵ خەڵکی سەمەرقەند و شوێنەکانی دیکە

لەم ساڵەدا ئەشرەس پەیکەکانی خۆی بۆ لای خەڵکی سەمەرقەند و ماوەرا ئەلنەهر رەوانە کرد و پێشنیاری باوەڕهێنان بەئیسلامی پێکردن لەسەر ئەو بنەمای کەچیتر باج نەدەن. بۆ ئەم کارە ئەبو صەیدا ءموالی بەنی زەببە و رەبیع کوڕی عێمرانی تەمیمی رەوانە کرد. ئەبو صەیدا ءوتی: خەراجیان بۆیە دیاری کردەوە کەهەر کەسێك باوەڕی بەئیسلام هێنا، باج نەدات، خەراجی خوراسان لەسەر بنەمای سەرانەی خەڵکانە. ئەشرەس وتی: بەم شێوەیە. ئەبو صەیدا ءبەهاوەڵانی خۆی وت: من دەڕۆم، ئەگەر کارگوزاران فەرمانبەریان نیشان نەدا، هاوکاریم دەکەن؟ وتیان: بەڵێ. بەرەو سەمەرقەند بەرێکەوت کەفەرماندارەکەی حەسەن کوڕی عەمرەتەی کێندی و سەرپەرەستی کاروباری تایبەت بەجەنگ و خەراج بو. ئەبو صەیدا ءپێشنیاری ئیسلامی بەخەڵکی سەمەرقەند و دەوروبەری کرد لەسەر ئەو بنەمای هەر کەس باوەڕ بەئیسلام بێنێت، باج نەدات. خەڵك باوەڕیان بەئیسلام هێنا. غەوزەك نامەی بۆ ئەشرەس نوسی کە خەراج لەناوچو. ئەشەرەس بۆ کوڕی عەمرەتەی نوسی کەخەراج هۆکاری بەهێزی موسوڵمانانە و ئاگاداریان کردومەتەوە کەسەغدیەکان و کەسانی وەك ئەوان بەحەز و ئارەزوی خۆیان باوەڕیان بەئیسلام نەهێناوە بەڵکو بۆ رزگار بون لەقورسایی باج، باوەڕداربون، بزانە هەر کەس خەتێنەی کردوە و کار پێویستەکانی دینی ئەنجامداوە و بەشێك لەقورئانی خوێندۆتەوە، باجی لەسەر هەڵبگرە.

دواتر ئەشرەس کوڕی عەمرەتەی لەکاروباری تایبەت بەخەراج دورخستەوە و ئەو کارەی بەهانی کوڕی هانی سپارد. ئەبو صەیدا ءئەوانی لەوەرگرتنی باج لەموسوڵمانان دورخستەوە. هانی بۆ ئەشرەسی نوسی خەڵکان باوەڕیان بەئیسلام هێناوە و مزگەوتەکانیان دروست کردوە. ئەشرەس بۆ ئەو و کارگوزارەکانی دیکە نامەی نوسی: لەو کەسانەی خەراجتان وەردەگرت، خەراج وەربگرن. ئەوان باج وەرگرتنیان لەموسوڵمانان سەر لەنوێ دەست پێکردوە. خەڵك پەنایان بۆ شوێنێکی پارێزراو برد و

حەوت هەزار کەس لەوێ کۆبونەوە. ئەم شوێنە چەندین فەرسەخ لەسەمەرقەندەوە دور بو. روبەرویان بونەوە: ئەبو صەیدا ە رەبیع کوڕی عیمرانی تەمیمی، هەیسەمی شەیبانی، ئەبو فاتیمەی ئەزدی، عامر کوڕی قوشەیر، بوحەیر خوجەندی، بەنانی عەنبەری و ئیسماعیل کوڕی عوقبە، مەبەستیان ئەوەبو هاوکاریان بکەن. ئەشرەس کوڕی عەمرەتەی لەسەرپەرەستی کردنی کاروباری تایبەت بەجەنگ لابرد و موجەشەر کوڕی موزاحیمی سولەمی لەجێگەی ئەو دانا و کاروباری شەڕی بەو سپارد و عومەیرە کوڕی سەعدی شەیبانی کردە یاریدەدەری ئەو.

کاتێك موجەشەر گەیشت، نامەی بۆ ئەبو صەیدا نوسی تا لەگەڵ هاوەڵانی بۆ لای ئەو بەرێکەوێت. ئەبو صەیدا ەو سابت کوڕی قوتنە هاتن و ئەم دوانەی خستە زیندان. ئەبو صەیدا ەوتی: پەیمانتان شکاند و لەبەڵێنەکەی خۆتان پەشیمان بونەوە. هانی وتی: ئەوەی دەبێتە هۆی پارێزرانی خوێنەکان، وەك پەیمان شکێنی هەژمار ناکرێت. دواتر ئەویان بۆ لای ئەشرەس رەوانە کرد. هاوەڵانی ئەو کۆبونەوە و ئەبو فاتیمەیان وەك رێبەری خۆیان هەڵبژارد و مەبەستی ئەوەیان کرد شەڕ لەگەڵ هانی بکەن. وتی: چاوەڕوان بن تا نامە بۆ ئەشرەس دەنوسم. نامەیان بۆ نوسی و وەڵامی دایەوە: خەراجیان لەسەر دیاری بکەن. هاوەڵانی ئەبو صەیدا ەگەڕانەوە و لاوازی و سستی لەکارەکانیان دەرکەوت، شوێن سەرکردەکانی ئەوان کەوتن و ئەوانیان گرت و رەوانەی مەرویان کردن. سابت لەزینداندا مایەوە. هانی لەباج وەرگرتن سەختی لەخۆی نیشاندا. سەرانی عەجەم و دێدارەکانیان ریسوا کرد، ئەوانیان دەوەستاند و جلەکانیان دەدڕین و پشتێنەکانیان دەکردنە مل و لەوانەی باوەڕیان بەئیسلام هێنابو (لەناتەوانان و کوێرەکان) باجیان وەرگرت و بەم شێوەیە خەڵکانی سەغد و بوخارا پشتیان کردە ئیسلام و تورکەکانیان بۆ شەڕی موسوڵمانان هاندا.

سابت قوتنە لەزیندانی موجەشەردا مایەوە تانەصر کوڕی سەیار وەك فەرمانداری ئەو ناوچەیە هاتە لای موجەشەر. موجەشەر ئەوی بۆ لای ئەشرەس رەوانە کرد کەئەوی خستە زیندان. نەصر چاکەی لەگەڵ کردبو. سابت کوڕی قوتنە قەسیدەیەکی بۆ وەسف کردنی ئەو هۆنیەوە کە چەند دێرێکی بەم شێوەیە:

ماهاج شوقك من نوی و احجار          و من رسوم عفاها صوب امطار

ان كان ظنى بنصر صادقا ابدا — فيما ادبر من نقضى و امرارى
لا يصرف الجند حتى يستفى بهم — نهبا عظيما و يحوى ملك جبار
انى و ان كنت من جذم الذى نصرت — منه الفروغ و زندى الثاقب الوارى
لذاكر منك امرا قد سبقت به — من كان قبلك يا نصر بن سيار
ناضلت عنى نضال الحر اذ قصرت — دونى العشيرة و استباطت انصارى
و صار كل صديق كنت امله — البا على ورث الجبل من جارى
و ما تلبست بالامر الذى و قعوا — به على و لا دنست اطمارى
و لا عصيت اماما كان طاعته — حقا على و لا قارفت من عار

یانی:

شور وشەیدایی تۆ، نەجۆگەلەكانی دەوروبەری خێوەتەكەی دڵدار هانیدا، نەبەردەكانی شوێنی مانەوەی ئەو و نە ئەو وێرانیانەی گەباران هەموی شۆردبویەوە. ئەگەر گومانی من سەبارەت بەنەصر بۆ هەمیشە راست بێت و لەهەمو كردارەكانی خۆم لە (شكان و بەستن) رێنوێنی لەو وەربگرم، ئەو سوپاییەكان ناگەرێنێتەوە تا بۆ هێرش بردن ناچاریان دەكات و تالآنیەكی گەورە بەدەست دێنێت و پاشایەتیەكەی بەهێز و مەزنی پێ دەبرێت. من هەرچەند لەو رەگ و ریشەم كە لقی تەڕ و تازەی دەركردوە و هەرچەندە لەدەسەچیلەی من بەردەوام ئاگر كڵپە دەستێنێت، لەتۆ، كارێك لەنەصر كوڕی سەیارم بیرە كە بە هۆیەوە پێش پێشینانی خۆت كەوتیتەوە. هاوشێوە پیاوە ئازادەكان لەبەرژەوەندی من شەڕت كرد و ئەمە لەكاتێكدا بو بنەماڵەكەم پشت گوێیان خستم و هاورێكانم لاوازیان لەخۆیان نیشاندا و هەر هاورێیەك كەدڵم پێخۆش كردبو، دژایەتی منی كرد و پەیوەندی جیرانەكانم بەرەو نەمان رۆشت. من گرفتاری ئەو كارە نەبوم كە ئەوان بەئەنجامدانی هەستان. داوێنی خۆم پیس نەكرد، لەرێبەری كەفەرمان بردن لەو ئەركی سەرشانی من بو، یاخی نەبوم و كارێكی شەرمێنەرم ئەنجام نەدا.

ئەشرەس بەمەبەستی شەڕ رۆشتە ئامول و بۆ ماوەی سێ مانگ لەوێ مایەوە. ئەو قەتن كوڕی قوتەیبە كوڕی موسلیمی هاورێ لەگەڵ دە هەزار شەڕكەر وەك پێشەنگی خۆی رەوانە كرد كە لەرووبار پەڕیەوە. سەغدیەكان و خەڵكی بوخار هاورێ لەگەڵ خاقان و توركەكان هاتن و قەتنیان لەسەنگەرەكەی گەمارۆدا. خاقان شەڕكەرانی رەوانە

کرد کە هێرشیان کردە سەر شوێنی مانەوەی خەڵکان. ئەشرەس بەنێوەنجیگەری عەبدالله کوڕی بێستام کوڕی مەسعود کوڕی عەمرۆ، سابتی لەزیندان ئازاد کرد و لەگەڵ سوارەکان بەسەرکردایەتی عەبدالله کوڕی بێستام ڕەوانەی کرد. لەئامول لەگەڵ تورکەکان شەڕیان کرد و هەموی ئەوەی دەستیان کەوتبو، لێیان وەرگرتنەوە و تورکەکان گەڕانەوە.

دواتر ئەشرەس خەڵکی بەرەو لای قەتن ڕەوانە و دەستەیەك شەڕکەری لەگەڵ پیاوێك بەناوی مەسعود لەبەنی حەیان ڕەوانە کرد. لەگەڵ ئەوان شەڕیان کرد و دەستەیەك لەموسوڵمانان کوژران و مەسعود شکستخواردو بۆ لای ئەشرەس گەڕایەوە. دوژمنان پێشڕەویان کرد و موسوڵمانان ڕوبەڕویان بونەوە، ماوەیەك تێکۆشان و خەڵکانێك لەموسوڵمانان کوژران، دواترموسوڵمانان هێرشیان برد و خۆڕاگریان نیشاندا و بتپەرستەکان شکستیان خوارد و ئەشرەس خەڵکی هەڵگرت و بردی و لەبیکەند دابەزی. دوژمن ئاوی لێ گرتنەوە و موسوڵمانان شەو و ڕۆژێك مانەوە و تینویەتی تەنگی پێ هەڵچنین. بەرەو ئەو شارە پێشڕەویان کرد کە ئاوەکە لەوێوە گیرابویەوە. فەرماندەی پێشەنگەکان قەتن کوڕی قوتەیبە بو. دوژمنان ڕوبەڕویان بوونەوە و شەڕیان دەست پێکرد و موسوڵمانان لەتینویەتیدا ئارامیان لێبڕا و حەوتسەد کەس لەوان لەشەڕ کردن ناتەوان بون. حارس کوڕی سورەیح خەڵکی بۆ شەڕ هاندەدا و دەیوت: شەڕ بەشمشێر لەم جیهانە باشترە و لەو جیهان لای پەروەردگار پاداشتێکی زیاتری هەیە و لەمردن لەتاو تینویەتی چاکترە. حارس و قەتن و سوارەکانی بەنی تەمیم هێرشیان برد و تورکەکانیان لەدەوروبەری ئاوەکە دورخستەوە و خەڵك ڕۆشتن و ئاویان خوارد و ئاویان هەڵگرت.

سابت قەتنە لای عەبدولەلیك کوڕی دێساری باهلی تێپەڕی و پێی وت: ئارەزوی ئەوەت هەیە ببێتە شەڕکەرێکی ڕێگەی خوا؟ وتی: مۆڵەتم پێ بدە تا سەرو ڕوخسار بشۆم و بۆنی خۆش لەخۆم بدەم. مایەوە تا سەر و ڕوخساری شۆرد و دواتر پێکەوە بەرێکەوتن. سابت بەهاوەڵانی خۆی وت: من بۆ شەڕ لەگەڵ ئەم خەڵکە، لەئێوە شارەزاترم. ئەوانی بۆ شەڕ هاندا. هێرشیان برد و شەڕ رووی لەدژواری کرد. سابت قەتنە وتی: ئەی خوایە، دوێ شەو میوانی کوڕی بێستام بوم، ئەمشەو میوانداری من بکە، سوێند بەخوا ڕێگە نادەم زادەکانی ئومەییە من لەزنجیردا ببینن. هەڵمەتی برد و

هاوڕێکانی لەگەڵ ئەودا هەڵمەتیان برد. هاوڕێکانی گەڕانەوە و ئەو مایەوە. ماینەکەیان تیرباران کرد کە هیلاك بو و لێیدا و بۆ پێشەوە غاریدا. سابتیان بریندار کرد و خستیانە سەر زەوی. نیوە گیان بو کە دەیوت: ئەی خوایە، دوێ شەو میوانی کوڕی بێستام بوم و ئەمشەو میوانی تۆ. لەبەهەشت میوانداری من بکە. ئەویان کوشت و لەگەڵ ئەو دەستەیەك لەموسوڵمانانیان کوشتار کرد، لەناو ئەوان: صەخر کوڕی موسلیم کوڕی نەعمانی عەبدی، عەبدولەلیك کوڕی دێساری باهلی و کەسانیتر. قەتن و ئیسحاق کوڕی محەممەد چەندین سوارکاریان لەموسوڵمانان کۆکردەوە و بۆ مەرگ پەیمانیان بەست. هێرشیان کردە سەر دوژمن و شەڕیان لەگەڵ کردن و پاشەکشێیان پێکردن. بەکوشتاری ئەوان سەرقاڵ بون تا شەو جیایی لەناویاندا دروست کرد و دوژمنان بڵاوەیان لێکرد و ئەشرەس بەرەو بوخارا بەرێکەوت و گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی.

## شەڕی کەمەرجە

خاقان گەمارۆی خستە سەر شاری کەمەرجە( لەگەورەترین شارەکانی خوراسان) کە دەستەیەك لەموسوڵمانان لەوێ نیشتەجێ بون. خەڵکی فەرغانە و ئەفشینە و نەسەف و دەستەیەك لەخەڵکی بوخارا هاوڕێیەتی خاقانیان دەکرد. موسوڵمانان دەروازەکانیان بەست و پردەکەیان وێران کرد. کوڕی خوسرەو کوڕی یەزدگێرد هات و وتی: ئەی عەرەبەکان بۆ خۆتان بە کوشتن دەدەن؟ من بوم خاقانم هێنا تا وڵاتەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە و هەنوکە ئەمانتان بۆ وەردەگرم. جوێن بارانیان کرد. (باز غەری) هاتە لایان. پیاوێکی بوێر و وشیار و بەهێز و فرمزان بو و خاقان سەرپێچی فەرمانەکانی ئەوی نەدەکرد. بەئەمانەوە لەموسوڵمانان نزیك کەوتەوە و وتی: کەسێك لەئێوە بێتە لای من تا پەیامی خاقان بگەیێنم. یەزید کوڕی سەعیدی باهلیان رەوانە کرد چونکە کەمێك تورکی دەزانی. پێی وت: خاقان منی رەوانە کردوە. دەڵێت: ئەوەی لەئێوە شەسەد وەردەگرێت، هەزاری پێدەبەخشم و ئەوەی سێسەدی هەیە، شەشسەد. ئەوچاکە لەگەڵ ئێوە دەکات. یەزید پێی وت: عەرەبەکان کەگورگن چۆن دەتوانن لەگەڵ تورکەکان هەڵبکەن کەمەڕن؟ بەم شێوەیە ئاشتی سەقامگیر نابێت. باز غەری توڕە بو. دو تورك هاوڕێیەتیان دەکرد کەپێیان وت: خوێنی نارێژیت؟ وتی: ئەمانی پێ بەخشراوە. یەزید تێگەیشت کەچی دەڵێن: ترسا و وتی: بەڵێ، ئێمە دەکەن بە دوکەرت، نیوەمان لەگەڵ کالآ

و کەل و پەلەکانمان دەڕوات و نیوەمان لەگەڵ ئێوە، ئەگەر سەرکەوتن، ئێمە لەگەڵ ئێوە دەبین و ئەگەر پێچەوانەی ئەمە روبدات، وەك شارەکانی دیکەی سەغد هەڵس و کەوت دەکەین. بەمە رازی بون. یەزید وتی: ئەمە بەهاورێکانم پێشنیار دەکەم. بەتەنافەکە رۆشتە سەرو کاتێك گەیشتە سەر دیوارەکە، وتی: ئەی خەڵکی کەمەرجە، کۆببنەوە چونکە خەڵکانێك گەمارۆی ئێوەیان داوە کە داوتان لێدەکەن ناباوەڕ ببن دوای ئەوەی کەباوەڕتان هێناوە، چی دەبینن. وتیان: رازی نین و پەسەندی ناکەین. وتی: داواتان لێدەکەن لەگەڵ بتپەرستەکان یەك بگرن و هێرش بکەنە سەر موسوڵمانان. وتیان: دەمرین و نایکەین. بازغەری گەڕایەوە.

دواترخاقان فەرمانیدا لەسەنگەرەکە بپەڕنەوە. ئەوان بەردەوام چیلەکەی تەڕیان تێدەکرد و موسوڵمانان چیلەکەی وشك. ئاگریان تێبەردا و بەفەرمانی خواوەند گێژەڵوکەیەکی توند هەڵیکرد و ئاگر لەچیلکە و چەوێڵەکانەوە بڵێسەی سەند. لەحەوت رۆژدا کۆیان کردبویەوە کە لەیەك ساتدا سوتا و بو بەخۆڵەمێش.

دواتر خاقان مەڕی لەناو تورکەکاندا دابەش کرد و فەرمانیدا گۆشتەکەی بخۆن و پێستەکەی پڕ بکەن لەخاك و خۆڵ و سەنگەرەکە پڕ بکەنەوە. ئەو کارەیان کرد و خواوەند بارانی باراند و لافاو، ئەوەی لەناو سەنگەرەکاندا بو، هەڵیگرت و بۆ ناو روباری مەهینی برد. موسوڵمانان ئەوانیان تیرباران کرد و زوبینێك لەناوکی بازغەری چەقی کە لەزیانەکەی هەمان شەو گیانی سپارد. مەرگی ئەو بۆ تورکەکان دژوار بو. کاتێك خۆر هەڵات، ئەسیرەکانیان هێنا کە ژمارەیان دەگەیشتە سەد کەس. ئەبو ئەلعەوجایپ عەتکی و حەجاج کوڕی حومەیدی نەزری لەناو ئەواندا بون. هەمویان سەر بڕی و سەری حەجاجیان فرێدا. لای موسوڵمانان سەد کەس لەبنەماڵەی بتپەرستەکان ئەسیر بون کە هەمویان کوشت و بۆ شەڕ کردن هەوڵیاندا و شەڕ رووی لەدژواری کرد.

خەڵکانی کەمەرجە بەهەمان شێوە بون تا سوپایی عەرەبەکان گەیشتن و لەفەرغانە دابەزین. خاقان دێدارەکان و سەغدیەکان و خەڵکی چاچ و هاووڵاتیانی فەرغانەی سەرکۆنە کرد و وتی: گومانتان دەکرد لەم شارە پەنجا کەر ژیان بەسەر دەبەن و من دەتوانم لەماوەی پێنج رۆژدا رایانماڵم بەڵام ئێستاکە دەبینن پێنج رۆژەکە بۆتە دو مانگ. فەرمانی کۆچ کردنی پێدان و سەرکۆنە و جوێنبارانی کردن. وتیان: لەهیچ

هەوڵێك كەمتەرخەمی ناكەین، بەیانی ئێمە بۆ گۆڕەپانی شەڕ ببە و بزانە چۆن لەناویان دەبەین. كاتێك بەیانی داهات، خاقان ریزی بەست و پاشای تاربەند (دەربەند) پێشرەوی دەستپێكرد و لەوان هەشت كەسی كوشت و هات لەسەر دیوارێك لەماڵێك كەنەخۆشێكی تەمیمی لەوێدا دەژیا، وەستا. پیاوی تەمیمی شەنێكی بۆ هاویشت كە لەزرێكەی گیری كرد. دواتر ژن و مناڵەكانی بانگ كرد و رایانكێشایە خوار و خستیانە سەر زەوی و پیاوێك بەردێكی بۆ هاویشت كەبەر بناگوێی كەوت و زەوی گیری كرد. كەسێكی دیكە بەشمشێر یا رِم لێیدا و بۆ ئەو دنیا رەوانەی كرد. مەرگی ئەو لای توركەكان دژوار بوو.

خاقان پەیامی بۆ موسوڵمانان رەوانە كرد: شێوەی ئێمە نیە كە كاتێك گەمارۆ دەخەینە سەر شارێك، پێش دەست بەسەردا گرتنی، وازی لێ بێنین. موسوڵمانان وتیان: لەئایینی ئێمەدا نیە كەخۆمان تەسلیمی دوژمن بكەین ئەگەرچی هەمومان بكوژرێین. هەر كارێك دەتوانن ئەنجامی بدەن. خاقان ئەمانی بەوان بەخشی لەسەر ئەو بنەمای ئەو لەوێ كۆچ بكات و ئەوانیش كۆچ بكەن و برۆنە سەمەرقەند یا دەبوسیە. خەڵكی كەمەرجە بینیان لەتەنگانەیەكی قورسدا گرفتار بون و لەبەر ئەمە بەو پێشنیارە رازی بون. بارمتەیان لەتوركەكان گرت تا زیانیان لێ نەدەن، خوازیاری ئەوە بون پاشاكەیان كورصولی توركی لەگەڵ دەستەیەك هاورێیەتی ئەوان بكات و تا دەبوسیە بیانپارێزێت. بارمتەیان بەوان دا و ئەوانیش بارمتەیان لەموسوڵمانان وەرگرت. خاقان كۆچی كرد و ئەوانیش دوای ئەو كۆچیان كرد. ئەو توركانەی لەگەڵ كورصول بون، پێیان وت: دەهەزار پیاوی شەڕكەر لەدەبوسیە ژیان بەسەر دەبەن و ئێمە دڵنیانین لەوەی هێرش نەكەنە سەرمان. موسوڵمانان وتیان: ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئێوە بكەن، شەڕیان لەگەڵ دەكەین.

بەرێكەوتن و كاتێك گەیشتنە یەك فەرسەخی دەبوسیە، خەڵكەكەی سوارەكانیان بینی و گومانیان برد كەمەرجە دەستی بەسەردا گیراوە و خاقان مەبەستی ئەوانی كردوە. لەبەر ئەمە خۆیان بۆ شەڕ ئامادە كرد بەڵام موسوڵمانان كەسیان رەوانە كرد و لەچۆنیەتی كاروبارەكان ئاگاداریان كردنەوە. بۆ پێشوازی كردنیان رۆشتن و ناتەوان و پەككەوتەكانیان هەڵگرت و تیماری بریندارەكانیان كرد. كاتێك موسوڵمانان گەیشتنە

دەبوسیە، کەسیان بۆ لای ئەو کەسە رەوانە کرد کە بارمتەکانیان لای ئەو دانابو. ئەوانیان ئاگادار کردەوە و پێیان وتن تا ئەوان ئازاد بکەن. تورکەکان کەسێکیان ئازاد دەکرد و موسوڵمانان کەسێك تا ئەوەی سێباع کوڕی نوعمان لەدەست تورکەکان مایەوە و پیاوێکی تورك لەدەستی موسوڵمانان. هەرکام لەوە دەترسا ئەویتر پەیمان شکێنی بکات، سێباع وتی: بارمتە تورکەکە ئازاد بکەن. ئەویان ئازاد کرد و سێباع لەدەست تورکەکان مایەوە. کورصوڵ پێی وت: بۆ ئەو کارەت کرد؟ وتی: پشتم بە تۆ گەرم بو و وتم کەسێکیت کەپەیمان شکێنی ناکەیت. کورصوڵ دیاری پێ بەخشی و کەرەستەی شەڕ و ماینێکی پێدا و ئازادی کرد.

ماوەی گەمارۆدانی کەمەرجە پەنجا و هەشت رۆژ بو. دەڵێن: ئەوان سی و پێنج رۆژیان بەسەر برد کە لەو ماوەدا نەیانتوانی ئاو بەوشترەکانیان بدەن.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکی کردر لەدین

لەم ساڵەدا خەڵکی کردر لەدین هەڵگەڕانەوە و ئەشرەس سوپایەکی رەوانە کرد کە بەسەر ئەواندا سەرکەوتن و عەرفجە وتی:

و نحن كفينا اهل مرو و غيرهم      و نحن نفينا الترك عن اهل كردر

فان تجعلوا ما قد غنمنا لغيرنا      فقد يظلم المرء الكريم فيصبر

یانی: ئێمە بوین هێرشمان کردە سەر خەڵکانی مەرو و کەسانیتر و لەناومان بردن و دواتر تورکانی دەوروبەری کردرمان کوشتار کرد. ئەگەر تالآنیەکانی ئێمە بەکەسانی دیکە ببەخشن، ترسمان نیە چونکە زۆرجار ستەم لەپیاوێکی رێزدار دەکەن و ئەو خۆڕاگری دەکاتە پیشە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا خالید قەسری، نوێژ و لێکۆڵینەوە لەنیازە تازەکان و فەرماندەیی پاسەوانان و سەرپەرەستی دامەزراوی دادی بەسرەی بە بەلال کوڕی ئەبی بەکرە سپارد و سومامەی لەسەرپەرەستی کردنی دامەزراوەی داد دور خستەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەسلەمە لە دەروازەی لان شەڕی لەگەڵ تورکەکان کرد و رووبەروی خاقان و سوپاکەی بویەوە. نزیکەی یەك مانگ شەڕیان کرد و دواتر بارانێکی قورس دەستی بەبارین کرد. خاقان پاشەکشێی کرد و مەسلەمە گەڕایەوە و لەرێگەی (دو شاخ) تێپەڕی. هەروەها لەم ساڵەدا معاویە لەسەرزەمینی رۆم شەڕی کرد و صەملەی گرت. هەروەها لەم ساڵەدا عەبداللە کوڕی عوقبەی فێهری شەڕی هاوینەی کرد. فەرماندەی سوپای دەریا عەبدولرەحمان کوڕی معاویە کوڕی حودەیج بو.

ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل لەم ساڵەدا حەجی لەگەڵ خەڵك کرد. فەرمانداری شارەکان ئەو کەسانە بون کە پێشتر ئاماژەمان پێدان.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: حەسەنی بەسری لە تەمەنی ٨٧ ساڵیدا، محەممەد کوڕی سیرین لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا، فەرزدقی شاعیر لەتەمەنی ٩١ ساڵی و جەریر کوڕی خەتەفی شاعیر.

## روداوەکانی ساڵی سەد و یانزەی کۆچی ( ٧٢٩ زایینی )

## لەسەر کار لابرانی ئەشرەس و دەست نیشان کردنی جونەید

لەم ساڵەدا هوشام، ئەشرەس کوڕی عەبداللەی لەفەرمانداری خوراسان لابرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بو کە شەداد کوڕی خولەیدی باهلی لای هوشام سکاڵای کرد. هوشام ئەوی لەسەر کار لابرد و جونەید کوڕی عەبدولرەحمانی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کرد. نەژادی ئەو بەم شێوەیە: جونەید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی خارجە کوڕی سەنان کوڕی ئەبی حارسەی موڕی. هۆکاری دەستنیشان کردنی ئەوە بو کەبۆ دایکی حەکەم کچی یەحیا کوڕی حەکەم ژن هوشام گەردنبەندێکی گەوهەرنیشانی بەدیاری برد کەهوشام پەسەندی کرد و وەك فەرماندار دەستنیشان و هەشت ئەسپی پەیکی تایبەتی بۆ دیاری کرد. ئەو هاوڕێ لەگەڵ پێنسەد کەس ڕۆشتە خوراسان و لەوێوە بەرەو ماوەرائەلنەهر بەرێکەوت و حەتاب کوڕی موحرێزی سولەمی نوێنەری ئەشەرەسی لەگەڵ خۆی برد و هەردوکیان لەروبار تێپەڕین. جونەید بۆ ئەشەرەس پەیامی نارد کە لەگەڵ سەغدیەکان و خەڵکی خوراسان شەڕی دەکرد: سوارەکان بۆ هاوکاری من رەوانە بکە. ترسا شتێك تایبەت بکات بەخۆی و لەوی بشارێتەوە. ئەشرەس، عامر کوڕی مالکی حیمانی بۆ لای ئەو رەوانە کرد. کاتێك عامر بەشێك لەرێگەی بڕی، تورکەکان و سەغدیەکان لەبەرابەری دەرکەوتن. ڕۆشتە ناو باخێك و لە کەلێنی دیوارەکە شەڕی لەگەڵ کردن و ئەم دو کەسە هاورێیەتیان دەکرد: وەرد کوڕی زیاد کوڕی ئەدهەم کوڕی کلسوم برای ئەسوەد کوڕی کولسوم و واصل کوڕی عەمرۆ قەیسی. واصل و عاصم کوڕی عومەیرەی سەمەرقەندی لەگەڵ کەسانی دیکە هاتنەدەر و بەدەوروبەری ئەو پانتاییە دەسوڕانەوە تا لەپشت ناوێکەوە، جێگیر بون. دار و قامیشیان کۆکردەوە و لەناوەکە پەڕینەوە. خاقان نەکەوتبوە خۆ کەدەنگی تەکبیری لەپشت سەری خۆیەوە بیست. موسوڵمانان لەگەڵ تورکەکان شەڕیان کرد و گەورەیەك لەگەورەکانی ئەوانیان کوشت و تورکەکان شکستیان خوارد و عامر بەرەو لای جونەید بەرێکەوت کە پێشوازی لێکرد و لەگەڵ ئەودا ملی رێگەی گرتەبەر. فەرماندەی

پێشەنگەکانی جونەید عومارە کوڕی حورەیم بو. کاتێك گەیشتنە دو فەرسەخی بیکەند، سوپا و سوارەکانی تورك هێرشیان کردە سەر و ئەو لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری کرد. ئەوەندەی نەمابو جونەید و هاوڕێکانی کوشتار بکرێن. دواتر خواوەند سەرکەوتنی بەوان بەخشی و بەرێکەوت تا گەیشتە سوپاکە. جونەید سەرکەوت و تورکەکان کوشتار کران و خاقان بەرەو لای ئەو پێشڕەوی کرد. ئەوان لەم لای (رەزمان) لەشارەکانی سەمەرقەند، روبەرووی یەك بونەوە و جونەید برازای خاقانی لەم شەڕەدا ئەسیر کرد و رەوانەی هوشامی کرد.

جونەید لەم شەڕەدا موجەشەر کوڕی موزاحیمی سولەمی وەك جێگری خۆی لەمەرو و سورە کوڕی حوڕی تەمیمی لە بەڵخ دەستنیشان کردبو. کاتێك لەم پانتاییەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دەستەیەکی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای هوشام رەوانە کرد. جونەید سەرکەوتوو بۆ مەرو گەڕایەوە. خاقان وتی: کوڕێکی فشەکەر و لەخۆباییە کە زێڕ و زیو بێ ئەندازە خەرج دەکات، ئەمساڵ ئەو منی تێکشکاند بەڵام ساڵی داهاتو منی شکستی پێ دێنم.

جونەید فەرماندارەکانی خۆی دیاری کرد و هەموویانی لەناو خەڵکانی موزەر هەڵبژارد. قەتن کوڕی قوتەیبەی کردە فەرمانداری بوخارا، وەلید کوڕی قەعقاعی عەبسی کردە فەرمانداری هەرات، حەبیب کوڕی موڕەی عەبسی کردە فەرماندەی پاسەوانەکانی خۆی و موسلیم کوڕی عەبدولرەحمانی باهلی کردە فەرمانداری بەلخ. فەرمانڕەوای بەلخ نەصر کوڕی سەیار بو. ئەو لەباهلیەکان خۆی بەدوور دەگرت و ئەمە دەرئەنجامی ئەو کینە و رقە بو کە لەشەڕی بروقان لەناو ئەواندا دروست بو. موسلیم کەسەکانی خۆی بۆ لای نەصر رەوانە کرد و ئەوان کاتێك گەیشتن کە نەصر خەوتبو و تەنیا کراسێکی لەبەردابو. بەهەمان شێوە ئەویان هێنایەدەر. پیرەپیاوێکی موزەری وتی: ئەوتان بەم شێوەیە هێنا! جونەید موسلیمی لەفەرمانداری بەلخ لابرد و یەحیا کوڕی زەبیعەی وەك فەرماندار دەستنیشان کرد و سەرپەرستی خەراجی سەمەرقەندی بەشەداد کوڕی خولەیدی باهلی سپارد.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام لەشەڕی هاوینەدا بەرەو چەپ بەرێکەوت و سەعید کوڕی هوشام بەرەو لای راست. ئەمیان خۆی گەیاندە کایسارسا. عەبدالله کوڕی ئەبی مریەم لەدەریا شەڕی کرد. هوشام بۆ هەمو کۆمەڵانی خەڵك لەمیسر و شام، حەکەم کوڕی قەیس کوڕی مەخرەمە کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی عەبدمەناف وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا تورکەکان هێرشیان کردە سەر ئازەربایەجان کەحارس کوڕی عەمرۆ لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری کرد و شکستی پێهێنان.

هەروەها لەم ساڵەدا، هوشام جەراح کوڕی عەبداللەی حەکەمی وەك فەرمانداری ئەرمەنیستان دەستنیشان کرد و براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیکی لەسەر کار لابرد. ئەو رۆشتە سەرزەمینی خەزەر و لەتفلیسەوە هێرشی کردەسەر و دەستی بەسەر (شاری سپی) ئەواندا گرت و تەندروست گەڕایەوە. خەڵکانی خەزەر کۆبونەوە و هێزەکانی خۆیان تەیار کرد و رویان کردە سەرزەمینەی ئیسلامیەکان و ئەمە بوە هۆی کوشتنی جەراح کە بەخواستی خوا لەگێڕانەوەی روداوەکانی ساڵەکانی داهاتودا ئاماژەی پێدەدەین.

هەروەها لەم ساڵەدا عوبەیدە کوڕی عەبدولرەحمان، کارگوزاری ئەفریقیە عوسمان کوڕی ئەسعەی لەفەرمانڕەوایی ئاندۆلۆس لەسەر کار لابرد و دوای ئەو هەیسەم کوڕی عوبەیدی کەنانی دەستنیشان کرد کە لەموحەرەمی ساڵی ١١١/ ئاوریلی ٧٢٩ زایینی گەشتە ئەو دیارە و لە زی حەججەی هەمان ساڵ/ مارسی ٧٣٠ زایینی کۆچی دوایی کرد و رۆژگاری فەرمانڕەوایەتیەکەی دە مانگی خایاند.

ئیبراهیم کوڕی هوشامی مەخزومی لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. کارگوزاران هەمان کەسانی ساڵی پێش بون جگە لەخوراسان کەجونەید فەرمانڕەوایەتی دەکرد و ئەرمەنستان کەجەراح کوڕی عەبدالله ئەرکی فەرمانڕەوایەتی لەئەستۆدا بو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و دوانزەی کۆچی ( ٧٣٠ زایینی )

## کوژرانی جەراحی حەکەمی

لەم ساڵەدا جەراح کوڕی عەبدالله‌ی حەکەمی کوژرا و هۆکارەکەی ئەوە بو پێشتر ئاماژەمان پێدا گەڕۆشتە ناو سەرزەمینی خەزەرەکان و شکستی پێهێنان. کاتێك شکستیان خوارد ئەوان لەگەڵ تورکەکان لەناوچەکانی لان کۆبونەوە و جەراج کوڕی عەبدالله لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی لەخەڵکانی شام ڕوبەڕویان بویەوە. شەڕێکی قورسیان دەسپێکرد کە خەڵکان هاوشێوەی ئەو شەڕەیان نەبینیبوو، هەردولا خۆڕاگریان کرد. خەزەرەکان و تورکەکان لەموسوڵمانان زیاتر بوون و جەراح و ئەوانەی هاوڕێیەتیان دەکرد لەمەرجی ئەردەبیل کوژران. ئەو براکەی حەجاج کوڕی عەبدالله‌ی وەك فەرمانداری ئەرمەنستان دەستنیشان کردبو.

کاتێك جەراح کوژرا، خەزەرەکان چاوی تەماحیان بڕییە عەرەبەکان و لەقولایی سەرزەمینە ئیسلامیەکان پێشڕەویان کرد تا گەیشتنە نزیکی موسڵ و کاروباریان لەموسوڵمانان دژوار کرد.

جەراح پیاوێکی چاکەکار و فرەزان و لەکارگوزارانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بو کەشاعیرەکان چەندین قەسیدەیان لەپرسەی ئەودا هۆنیوەتەوە. دەستەیەك دەڵێن: لەبەلەنجەر کوژرا.

کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەو بەهوشام گەیشت، سەعیدی حەرەشی بانگ کرد و پێی وت: بیستوومە جەراح لەبەرابەر بتپەرستەکان پاشەکشێی کردوە. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەرگیز، جەراح لەوە خواپەرستتر بو کەپاشەکشێ بکات. ئەو کوژراوە. وتی: بۆچونی تۆ چیە؟ وتی: من لەگەڵ چل چوارپێی پەیك ڕەوانە دەکەیت و دواتر هەمو شەو و ڕۆژێك چل پیاو بۆ هاوکاری من ڕەوانە بکە. دواتر فەرماندە و فەرماندەکان لەبارودۆخ ئاگادار دەکەیتەوە.

هوشام ئەو کارەی کرد و حەرەشی بەرێکەوت و دەگەیشتە هەر شارێك خەڵکی بۆ شەڕ هاندەدا وئەو کەسانەی خوازیاری شەڕ لەرێگەی خوادابون، وەلامیان دایەوە. ئەم

کارەی کرد تا گەیشتە شاری ئەرزەن. لێرە دەستەیەك لەهاوەڵانی جەراح چاویان بەحەرەشی کەوت و لەپرسەی ئەودا گریان. حەرشیش گریا و بەخششی بەوان بەخشی و ئەوانی لەگەڵ خۆی گەڕاندەوە. هەرکەس لەهاوەڵانی جەراحی دەبینی، لەگەڵ خۆی دەیگەڕاندەوە. گەیشتە خێلات و بینی بەشێوەیەکی سەیر پارێزراوە. گەمارۆی خستەسەر و دەستی بەسەردا گرت و تالآنیەکانی دەسکەوت و لەناو هاوەڵانی خۆیدا دابەشی کرد. دواتر لەخێلات هاتەدەر ویەك یەك دەستی بەسەر شار و قەلآکاندا گرت تا گەیشتە شاری بەرزەعە و لەوێ دابەزی.

لەم کاتەدا کوڕی خاقان لەئازەربایەجان سەرقاڵی شەڕ و کوشتار و تالآنی و ئەسیری کردنی خەڵکان و گەمارۆی خستبوە سەر شاری وەرسان. حەرەشی ترسا کوڕی خاقان دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرێت. یەکێك لەهاوەڵانی خۆی بەنهێنی بۆلای خەڵکی وەرسان رەوانە کرد و لەهاوکاری خۆی ئاگاداری کردنەوە. داوایان لەوان کرد خۆڕاگری بکەنە پیشە. پەیك بەرێکەوت. یەکێك لەخەڵکانی خەزەر ئەوی بینی. ئەویان گرت و پرسیاریان لێکرد. ئەو هەمو شتێکی بەراستی پێ وتن. پێیان وت: ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێدەدەین ئەنجامی بدەیت، رێزت لێ دەگرین و ئازادت دەکەین و گەرنە دەتکوژین. وتی: چیتان دەوێت؟ وتیان: بەخەڵکانی وەرسان بڵێ کەهیچ یار و پشتیوانێکتان نیە و کەس نیە قورسایی ئەم خەمە لەسەر شانی ئێوە هەڵبگرێت. پێشنیاریان پێبکە شارەکەیان تەسلیمی ئێمە بکەن. رازی بو.

کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە، لەشوێنێکدا وەستا کەخەڵك دەنگیان دەبیست. وتی: من دەناسن. وتیان: بەڵێ، فلآن کەسیت. وتی: کەواتە بزانن و ئاگاداربن کەحەرەشی گەشتۆتە فلآنە شوێن و فیسارە شوێن و سوپایەکی فراوان هاورێیەتی دەکات، فەرمان بەئێوە دەکات پارێزگاری لەشارەکەتان و خۆڕاگری بکەن چونکە لەم یەك دو رۆژەدا بۆ هاوکاری ئێوە دێت. خەڵکی دەنگی تەکبیریان خۆیان وەك نیشانەی سوپاس کردنی خواوەند بەرز کردەوە.

خەزرەکان ئەو پیاوەیان کوشت و لەشاری وەرسان پاشەکشێیان کرد و حەرەشی و سوپاکەی گەیشتنە ئەو شوێنە و بینیان کەس لەوێ نەماوەتەوە. بەدوای خەزەرەکان بەرەو ئەردەبیل بەرێکەوت. خەزرەکان لەوێ کۆچیان کرد و حەرەشی لەباژەروان

دابەزی. سوارمیەك لەسەر ئەسپێکی سپی هاتە لای، سلاوی بۆ نارد و وتی: ئەی فەرماندار، دەتەوێت شەڕ بکەیت و تالآنی بەدەست بێنیت؟ وتی: چۆن؟ وتی: دەهەزار شەڕکەر لەخەزەرەکان کە پێنج هەزار کەس لەبنەماڵەی موسوڵمانانیان بەئەسیری و کۆیلایەتی گرتوە، لەچوار فەرسەخی ئێرە دابەزیون.

حەرەشی لەکاتی شەو بەرێکەوت و بەرەبەیان لەوان نزیك کەوتەوە و بینی کەهەمویان خەوتون. بەهەڵاتنی خۆی گەمارۆی خستە سەر ئەوان و موسوڵمانان شمشێریان لەناو ئەواندا سوڕاند. هەتاو بەتەواوەتی هەڵنەهاتبو کەهەمویان کوژران جگە لەیەك پیاو کەرزگاری بو. حەرەشی موسوڵمانە ئەسیرەکانی ئازاد کرد و ئەوانی بەرەو باژەروان گەڕاندەوە. کاتێك ڕۆشتە ناو شارەکە، ئەو پیاوەی لەسەر ئەسپە سپییەکە ڕۆشتبوە لای، هات و سلاوی بۆ نارد و وتی: ئێستا سوپای خەزەرەکان هاورێ لەگەڵ سامانی موسوڵمانان لەگەڵ بنەماڵەی جەراحی پاڵەوان و منداڵەکانی لەفلآنە شوێن و فیسارە شوێندان. حەرەشی بەرێکەوت. نەکەوتبونە خۆ کەموسوڵمانانیان لەسەر سەری خۆیان بینی. موسوڵمانان شمشێریان خستە ناویان و تا ئەو جێگەی ویستیان کوشتاریان کرد و جگە لەدەستەیەکی کەم، کەس رزگاری نەبو. ژن و پیاوە ئەسیرەکانی ئازاد کرد و سامانەکانی وەرگرتەوە و حەرەشی منداڵەکانی جەراحی هەڵگرت و ڕێزی لێگرتن و هەمویان بۆ باژەروان برد.

هەواڵی شەڕەکانی ئەو لەگەڵ خەزەرەکان بەگوێی کوڕی پاشاکەیان گەیشت. سەرکۆنەی سوپاکەی خۆی کرد و بەسستی و لاوازی تۆمەتباری کردن. ئەوان یەکتریان بۆ شەڕ هاندا وپێشنیاریان پێکرد هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوە و بۆ شەڕی حەرەشی بەرێکەوێت. ئەو هاوەڵانی لەپانتاییەکانی ئازەربایەجان کۆکردەوە و بەم شێوەیە سوپایەکی گەورە لەدەوری ئەو کۆبونەوە و حەرەشیش بەرێکەوت. دو سوپا روبەروی یەك بونەوە و لەسەرزەمینی بەرزەند شەڕی یەکیان کرد و قورسترین و دژوارترینی شەڕەکانیان ئەنجامدا. موسوڵمانان کەمێك پاشەکشێیان کرد. حەرەشی ئەوانی بۆ شەڕ هاندا و داوای لێکردن بەرگری بکەن. بۆ گۆڕەپانی شەڕ گەڕانەوە و پیاوانە تێکۆشان. ئەسیرانی موسوڵمان ئاوازی فریاکەوتنیان بەرز کردەوە و تەکبیر و سوپاسی خوایان دەکرد و دەپاڕانەوە. لەم کاتەدا بو کەموسوڵمانان بوێری شەڕکردنیان پێبڕا و بە کوڵ بۆ

دیله موسوڵمانەکان گریان و بەشێوەیەکی چالاك و ئازایانە هێزی خۆیان بۆ شەڕ کردن تەرخان کرد کەخەزرەکان شکستیان خوارد و هەڵاتن و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن تا گەیشتنە رووباری ئەرەس و دواتر گەڕانەوە و هەمو تاڵانیەکانی ناو لەشکرگەکەی ئەوانیان کۆکردەوە و ئەسیر و گرفتارەکانیان ئازاد کرد و رەوانەی باژەروانیان کردن.

دواتر پاشای خەزەرەکان هەمو شەڕکەرانی کۆکردەوە و ئەوانی بۆ شەڕی حەرەشی گەڕاندەوە و لەکەنارەکانی رووباری بیلقان دابەزین. ئەم هەواڵە بەحەرەشی گەیشت و لەگەڵ سوپای موسوڵمانان بەرێکەوت و لەکەنارەکانی روباری بیلقان چاوی بەوان کەوت. لەوێ رووبەرووی یەك بونەوە. حەرەشی بەسەر شەڕکەراندا قیژاندی و ئەوان هەڵمەتێکی راستەقینەیان برد و ریزەکانی خەزەرەکانیان هەڵوەشاند. چەندین جار هێرشیان کردە سەریان و خەزەرەکان بەشێوەیەکی سەیر خۆڕاگریان دەکرد تا ئەوەی شکستیان خوارد و هەڵاتن. ئەو کەسانەی لەناو روبارەکەدا خنکان لەکوژراوانی ناو گۆڕەپانەکە زیاتر بون.

حەرەشی تاڵانیەکانی کۆکردەوە و بۆ باژەروان گەڕایەوە. تاڵانیەکانی دابەش کرد و پێنج یەکی بۆ هوشام کوڕی عەبدولەلیك رەوانە کرد و لەسەرکەوتنەکانی خۆی ئاگاداری کردەوە. هوشام نامەی بۆنوسی و سوپاسی کرد. ئەو لەباژەروان مایەوە و لەم شارە نامەی هوشامی پێگەیشت کەفەرمانی پێدەدا بۆ لای ئەو بگەرێتەوە. هوشام براکەی مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیکی وەك فەرمانداری ئەرمەنستان و ئازەربایەجان دەستنیشان کرد. مەسلەمە گەیشتە ئەم سەرزەمینە و لەزستان و سەرمای سارد شوێن تورکەکان کەوت تا لەباب تێپەڕی.

## شەڕی جونەید لە شێعب

لەم ساڵەدا جونەید بۆ شەڕ ڕۆشتەدەر و مەبەستی تەخارستانی کرد و عومار کوڕی حوریەمی لەگەڵ هەژدە هەزار پیاوی شەڕکەر رەوانەی تەخارستان کرد و ئیبراهیم کوڕی بەسامی لەیسی لەگەڵ دەهەزار شەڕکەر بۆ ناوچەیەکی دیکە نارد. تورکەکان کەوتنەخۆ و ڕۆشتنە سەمەرقەند کەسورە کوڕی حوڕ فەرمانڕەوایەتی دەکرد. سورە نامەی بۆ جونەید نوسی: خاقان تورکەکانی هانداوە و من بۆ شەڕی ئەوان بەرێکەوتوم و ناتوانی پارێزگاری لەدیواری سەمەرقەند بکەم، بۆ هاوکاری کردنی من رەوانە بە.

فریام کەوە.

لەم کاتەدا جونەید فەرمانی بەخەڵکدا لەرووبار بپەڕنەوە. موجەشەر کوڕی موزاحیمی سولەمی و کوڕی بێستامی ئەزدی و کەسانیتر هەستان و وتیان: تورکەکان هاوشێوەی خەڵکانی دیکە نین. تەنیا لەیەك بەرە شەڕی تۆ ناکەن و بەیەك پێشڕەوی کۆتایی بەشەڕ ناهێنن بەتایبەت کەئێستا تۆ بڵاوەت بەسوپاکەت کردوە چونکە موسلیم کوڕی عەبدولرەحمان لە بیروده و بەختەری لەهەرات و عومارە کوڕی حوریەم لێرە دورە و لە تەخارستانە و پاشای خوراسان بەسوپایەکی کەمتر لەپەنجا هەزار پیاوی شەڕکەر لەرووبار ناپەڕێتەوە. نامە بۆ عومارە بنوسە تا بۆ هاوکاری تۆ رەوانە بێت، چاوەڕوان بە و پەلە مەکە. وتی: چۆن بتوانم سورە و موسوڵمانان لەقوڕگی دوژمندا بەجێ بێڵم؟ ئەگەر تەنیا لەگەڵ بەنی مورە یا هاوەڵە شامیەکانی خۆم دەبوم، لەرووبار دەپەڕیمەوە. دواتر ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

اليس احق الناس ان يشهد الوغى          و ان يقتل الا بطال ضخما على ضخم

یانی: ئایا پاڵەوانەکان شیاوتریەی خەڵکان نین کە لەگۆڕەپانی شەڕدابن و لەکوژرانی ئەوان تەپۆڵکەکان دروست ببێت.

دوبارە وتی:

ما علتى ما علتى ما علتى          ان لم اقاتلهم فجروا لمتى

یانی: من چەندە دەردم هەیە دەردەم هەیە، دەردەم هەیە؟ ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئەوان ناکەم، پرچەکانم ببڕن.

لەرووبار تێپەڕی و لەکێش دابەزی و بۆ ڕۆشتن خۆی ئامادە کرد. هەواڵی بەرێکەوتنی ئەو بەتورکەکان گەیشت و ئەوان چاڵاوەکانی رێگەی کێشیان کوێر کردەوە. جونەید وتی: کام رێگە بۆ گەیشتن بە سەمەرقەند نزیکتر و باشترە؟ وتیان: رێگەی سووتاو. موجەشەر وتی: کوژران بەشمشێر باشترە لەکوژران بەئاگر. رێگەی سووتاو دار و چیلکە و چقڵ و خاك و خۆڵی زۆری هەیە و دو ساڵە کشتوکاڵیان لێ نەکردوە. ئەگەر لەم رێگاوە بۆ رووبەروو بونەوەی خاقان بڕۆین، هەمومان ئاگر دەدات و بەئاگر دەمانسوتێنێت. لەرێگەی گەردەنەی عەقەبەوە بەرێکەوە کە لەنێوان ئێمە و ئەودا بەرابەرە. جونەید رێگەی گەردەنەی گرتەبەر و بەکێوەکەدا سەرکەوت. موجەشەر

هەوساری مایینەکەی ئەوی گرت و وتی: لە کۆنەوە بیستومە کەوتویانە: پیاوێکی پڕخەرجی لەقەیس دەردەکەوێت و سوپایەك لەلەشکرەکەی خوراسان لەسەر دەستی ئەو لەناو دەچێت. جونەید وتی: ئەگەر پاڵەوانانی وەك تۆ لەناو ئێمەدا بن، ترسمان نیە. ئەو لەبن گەردەنەکە شەوی کردە رۆژ و دواتر فەرمانی رۆشتنی بەخەڵکاندا تا ئەوەی دوری ئەوان لەسەمەرقەند تەنیا چوار فەرسەخ بو. دواتر ڕۆشتە ناو دۆڵەکە. خاقان بەسوپایەکی گەورە لەکاتی بەرەبەیان هێرشی کردەسەر. سەغدیەکان و خەڵکی چاچ وخەڵکی فەرغانە لەگەڵ سوپایەك لەتورکەکان پێشڕەویان دەستپێکرد. خاقان هێرشی کردە سەر پێشەنگەکان کەعوسمان کوڕی عەبداللە کوڕی شەخیر فەرماندەیی ئەوانی لەدەستدابوو. ئەوان بۆ لەشکرگەکە گەڕانەوە و تورکەکان بەدوایانەوە بوون و لەهەر چوار لاوە هێرشیان کردە سەریان. جونەید تەمیمیەکان و ئەزدیەکانی لەباڵی راست جێگیر کرد، خەڵکی رەبیعەی لەباڵی چەپ لەلای کێوەکە، فەرماندەی سوارکارەکانی بەنی تەمیمی بەعوبەیداللە کوڕی زوهەیر کوڕی حەیان و فەرماندەی سوارەکانی دیکەی بەعەمرۆ کوڕی جێرقاش مێنقەری سپارد. بۆ سوپاکەی بەنی تەمیم عامر کوڕی مالکی حێمانی وەك فەرماندە دەستنیشان کرد، بۆ خەڵکی ئەزد عەبداللە کوڕی بێستام کوڕی مەسعود کوڕی عەمرۆ و بۆ سوارکارەکان فوزەیل کوڕی هەناد و عەبداللە کوڕی حەوەزان.

ئەوان روبەرووی یەك بونەوە و شەڕیان دەست پێکرد و شەڕکەرانی باڵی راست پێشڕەویان دەستپێکرد چونکە باڵی چەپ کەوتبوە گێژاوەوە. حسان کوڕی عوبەیداللە کوڕی زوهەیر لەبەرابەر باوکی دابەزی. باوك فەرمانی پێدا سوار بێت و سوار بوو. دوژمنان مەبەستی کوشتاری شەڕکەرانی باڵی راستیان کرد و جونەید فەرمانی بەنەصر کوڕی سەیاردا هاوکاری ئەوان بکات. نەصر و سوپاکەی هێرشیان کردە سەر دوژمن و پاشەکشێیان پێکردن. دواتر تورکەکان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان و عوبەیداللە کوڕی زوهەیر و کوڕی جێرقاش و فوزەیل کوڕی هەنادیان کوشت. شەڕکەرانی باڵی راست بزوتنەوەیان دەستپێکرد و سوپاکە هەمان شێوە لە دڵی ئەو لەشکرەدا وەستابو. روی کردە باڵی راست و لەژێر ئالای ئەزدیەکان وەستا، چونکە ئەوانی رەنجاندبو. ئالأدار پێی وت: ئێمە بۆ ئەوە ناکوژرێین کەتۆ رێزمان لێ بگریت (تۆیش خوازیاری دڵدانەوەی

ئێمە نیت) بەڵکو دەزانی تا یەك کەس لەئێمە زیندو بێت، دوژمن دەستی بەتۆ ناگات، ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنین لەبەرژەوەندی تۆ دەبێت و ئەگەر لەناو بچین، فرمێسك بۆ ئێمە نارێژیت. هەژدە پیاو یەك لەدوای یەك ئەو ئاڵایان هەڵگرت و کوژران. لەو رۆژەدا هەشتا شەرکەری ئەزدی کوژران.

خەڵك ئەوەندە خۆڕاگریان کرد کەبێزار بون و شمشێرەکان چیتر کاریگەریان لەسەرجەستەکان دانەدەنا. کۆیلەکانیان دارەکانیان بڕی و شەڕیان کرد تا هەردولای شەڕکەر بەتەواوی شەکەت بون. دواتر شەڕکەران شەڕی دەستەویەخەیان کرد و لێك جیابونەوە. ئەم کەسانە لەخەڵکانی ئەزد کوژران: عەبداللە کوڕی بێستام، محەممەد کوڕی عەبداللە کوڕی حەوەزان، حەسەن کوڕی شێخ، فوزەیلی سوارکار و یەزید کوڕی فەزڵی حەدانی. یەزید حەجی کرد و لەحەجەکەی خۆی سەد و هەشتا هەزار درەمی خەرج کرد و بەدایکی وت: لەخوا بپارێرەوە تا گیان بەخشین بەمن ببەخشێت. دایك پاڕایەوە بەڵام لەهۆش چوو. یەزید سیانزە رۆژ دوای گەڕانەوەی لەحەج کوژرا. نەزر کوڕی راشدی عەبدی کوژرا. ئەو ڕۆشتبوە لای ژنەکەی لەگەڵ ئەوەی خەڵك لەم کاتەدا سەرقاڵی شەڕ بون. بەژنەکەی خۆی وت: ئەگەر ئەبو زەمورە لەپارچەیەکی پەشمین، بەجەستەیەکی خوێناوی بێننە لای تۆ، حاڵت چۆن دەبێت؟ ژن یەخەی خۆی دڕی و گریانی دەست پێکرد. پیاو وتی: بەسی کە، ئەوەندە شەیدایی ژنە چاو گەورە بەهەشتیەکانم کە ئەگەر هەمو ژنەکانی جیهان بۆ من بگرین و خۆیان بەداوێنمەوە هەڵواسن، پشت لەوان ناکەم! گەڕایەوە و شەڕی کرد تا کوژرا.

خەڵك سەرقاڵی شەڕ کردن بون کەتەپ و تۆز بۆ ئاسمان بەرزبویەوە و دو ئەسپ دەرکەوتن. جارچیەکەی جونەید جاڕیدا: خۆتان بخەنە سەر زەوی، خۆتان بخەنە سەر زەوی. ئەو دابەزی و خەڵك دابەزین. دواتر هاواری کرد: هەرکەس بەشێوەی خۆی بڕواتە ناو سەنگەرەکەی و پەنا بۆ چاڵێك ببات. پەنایان بۆ سەنگەر و چاڵەکان برد و لەدوژمن جیابونەوە. لەخەڵکانی ئەزد سەد و نەوەد کەس کوژران. شەڕی ئەوان لەرۆژی هەینی رویدا. کاتێك رۆژی شەممە داهات، خاقان لەکاتی نیمەڕۆ مەبەستی ئەوانی کرد و شوێنێکی ئاسانتری بۆ شەڕ کردن لە شوێنی خەڵکی بەکر کوڕی وایل بەفەرماندەیی زیاد کوڕی حارس نەبینی. مەبەستی کوشتاری ئەوانی کرد. کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە،

بەکریەکان هێرشیان کرد و دوژمن پاشەکشێی کرد و جونەید سەری خستە سەرزەوی و کورنوشی بۆ خوا برد. شەڕ سات لەدوای سات دژوارتر دەبو.

## کوژرانی سورە کوڕی حوڕ

کاتێك شەڕ دژوار و جونەید سەختی شەڕی بینی، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد. عوبەیداللە کوڕی حەبیب پێی وت: یەکێك لەم دو کارە هەڵبژێرە یا لەناوچونی خۆت یا لەناوچونی سورە کوڕی حوڕ. وتی: لەناچونی سورە بۆ من ئاسانترە. وتی: نامەی بۆ بنوسە تا لەگەڵ خەڵکی سەمەرقەند بۆ هاوکاری تۆ بێت چونکە کاتێك بەرێبکەوێت و تورکەکان لەمە ئاگادار ببنەوە، رووبەکەنە ئەو و شەڕ لەگەڵ ئەو دەکەن. جونەید نامەی بۆ نوسی و فەرمانی پێدا رەوانە ببێت. حولەیس کوڕی غالبی شەیبانی بەسورەی وت: تورکەکان لەنێوان تۆ و جونەید جێگیرن، ئەگەر بڕۆیتەدەر، هێرش دەکەنە سەرتۆ و تۆ لەناو دەبەن. سورە نامەی بۆ جونەید نوسی: ناتوانم ئەو کارە بکەم. جونەید بۆی نوسی: ئەی زادەی ژنی بۆگەن، بەرێکەوە وەگەرنە شەداد کوڕی خولەیدی باهلی رەوانە دەکەم تا تۆ بێنێت (شەداد دوژمنی ئەو بو). لەکەنارەکانی ئاوەکەوە بەرێکەوە و لێی جیا مەبەرەوە. ئەو مەبەستی رۆشتنی کرد و وتی: ئەگەر لەکەناری رووبارەکەوە بەرێکەوم، لەدوو رۆژدا ناگەم لەگەڵ ئەوەی لەنێوان من و ئەو زیاتر لەیەك شەو رێگە نیە، کاتێك ئەو بێدەنگ بێت، بەرێدەکەوم.

سیخورەکانی تورك هەواڵی بەرێکەوتنی سورەیان هێنا. سورە بەرێکەوت و موسا کوڕی ئەسەدی حەنزەلی وەك جێگری خۆی لەسەمەرقەند دەسنیشان کرد. ئەو هاوڕێ لەگەڵ دوانزە هەزار پیاوی شەڕکەر بەرێکەوت. بەرەبەیان لەسەر لوتکەی کێوەکە بو. خاقان لەکاتی بەرەبەیان رووبەرووی بویەوە و لەم کاتەدا سێ فەرسەخی رێگاکەی بڕیبو و تەنیا یەك فەرسخ لەجونەید دوور بو. شەڕ رووی لەدژواری کرد و ئەوان خۆڕاگریان لەخۆیان نیشاندا. غوزەك بەخاقانی وت: ئەمڕۆ گەرمە، شەڕ لەگەڵ ئەوان مەکە تا کەرەستەکانی شەڕ لەبەر ئەواندا گەرم و سوتێنەر بێت و گەرما تەنگیان پێ هەڵچنێت. خاقان بۆ شەڕی ئەوان ریزی بەست و ئاگری لەچیلکە و گژوگیاکان بەردا و ئەوانی لەئاوەکە جیا کردەوە. سورە بە عوبادەی وت: ئەی باوکی سەلیم، چی دەبینیت؟ وتی: گومان دەکەم تورکەکان خوازیاری تالانین، کەواتە ئەسپەکان بکوژە، کالاکان بسوتێنە و

شمشێر لەکاڵان دەرکێشە چونکە لەم کاتەدا رێگەی ئێمە دەکەنەوە و ئەگەر رێگەمان لێ بگرن، رمەکان بەرز دەکەینەوە و درێژە بەرێگەی خۆمان دەدەین. سورە وتی: نە من دەتوانم ئەو کارە بکەم نە فلانە کەس و فیسارە کەس. ناوی چەندین کەسی برد و زیادی کرد: سوارەکان کۆدەکەمەوە و هێرش دەکەمە سەر ئەوان هەرچەند تەندروست بگەرێمەوە یا بکوژرێم.

خەڵکی کۆکردەوە و هێرشی برد. تورکەکان پاشەکشێیان کرد و تەپ و تۆز بۆ ئاسمان بەرز بویەوە و کەسیان نەبینی. لەپشت سەری تورکەکان ئاگر بڵێسەی دەسەند کەکەوتنە ناوی. دوژمنان کەوتنە ئاگرەکەوە و موسوڵمانان بەدوایاندا. سورە کەوت و رانی شکا و خەڵك بلاّوەیان لێکرد. تورکەکان ئەوانیان کوشتار کرد و جگە لەدوهەزار یا هەزار پیاوی شەرکەر کەس رزگاری نەبو. یەکێك لەرزگاربوان عاصم کوڕی عومەیری سەمەرقەندی بو. حولەیس کوڕی غالبی شەیبانی کوژرا و موهەلیب کوڕی زیادی عێجلی لەگەڵ حەوتسەد کەس رووی کردە گوندی مورغب و لەکۆشکی ئەو گوندە دابەزین. ئاشکەند پاشای نەسەف لەگەڵ سوارەکان و غوزەك هاتنە سەریان و غوزەك ئەمانی پێ بەخشین. قورەیش کوڕی عەبداللە عەبدی وتی: باوەڕیان پێمەکەن، کاتێك شەو داهات، دەرۆینەدەر تا دەگەینە سەمەرقەند. نافەرمانی ئەویان کرد و تەسلیم بون و غوزەك ئەوانی بۆ لای خاقان برد کەوتی: گرنگی بەئەمانەکەی غوزەك نادەم. وەجف کوڕی خالید و موسوڵمانەکان شەڕیان لەگەڵ کرد و هەمویان جگە لەحەفدە کەس کوژران کە لەناو ئەوان سیانیان بەزیندویی مانەوە.

سورە لەناو بڵێسەکانی ئاگردا کوژرا. کاتێك کوژرا، جونەید لەدۆڵەکە هاتەدەر و یەکراست بەرەو سەمەرقەند بەرێکەوت. خالید کوڕی عەبداللە پێی وت: برۆ و پەلە بکە. موجەشەر پێی وت: دابەزە و هەوساری ئەسپەکەی بگرە. ئەو دابەزی و خەڵك دابەزین. هێشتا هەمویان دانەبەزیبون کەتورکەکان دەرکەوتن. موجەشەر وتی: ئەگەر رووبەری ئێمە دەبونەوە و ئێمە بەرێدەکەوتین، لەناو نەدەچوین؟ کاتێك بەرەبەیان بویەوە، خەڵك هەستان و کەوتنە جموجۆڵ. جونەید وتی: ئەی خەڵکینە، ئاگر گەمارۆی ئێوەی داوە. گەڕانەوە و جونەید هاواری کرد: کۆیلەیەك کەپیاوانە شەڕ بکات، ئازادە. کۆیلەکان بەشێوەیەك شەڕیان کرد کەخەڵکان سەریان سوڕما. لەوەی بینیان شادمان بون

و خەڵکان خۆڕاگریان کرد تا دوژمن شکستیان خوارد و بەرێگەی خۆیاندا ڕۆشتن. موسا کوڕی قەعرا ءبەخەڵکەکەی خۆی وت: بەوەی لەکۆیلەکان بینیتان، شادمان بون! ئێوە شەڕێکی قورستان لەگەڵ ئەوان لەبەردەمدایە.

جونەید بەرەو سەمەرقەند بەرێکەوت ژنەکانی سورە کوڕی حوڕی بۆ مەرو برد و چوار مانگ لە سەغد مایەوە. ڕاوێژکاری خوراسان لەکاروباری تایبەت بەجەنگ موجەشەر کوڕی موزاحیم و عەبدولرەحمان کوڕی صوبحی خەرەقی و عوبەیدالله کوڕی حەبیبی هیجری بون. موجەشەر خەڵکی لەژێر ئالآکاندا کۆدەکردەوە و بناغەی پادگانەکانی دارشت. هیچ کەس لەم کارەدا تێگەیشتنی ئەوی نەبوو. عەبدولرەحمان بەشێوەیەك بو کاتێك کارێك یا پێشهاتێکی گەورە روویدەدا یا شەڕ رووی لەدژواری دەکرد، بۆچونەکانی کاریگەری گرنگیان بەجێ دەهێشت. عوبەیدالله کاری ئامادەکردن و کۆکردنەوەی خەڵکی بۆ شەڕ لەئەستۆدابوو. کەسانی دیکەیش لەموالیەکان، بۆچون و زانایی ئەوانیان لەکاروباری تایبەت بەجەنگدا هەبوو، لەناو ئەوان: فەزڵ کوڕی بەسام موالی لەیس، عەبدالله کوڕی ئەبی عەبدالله موالی سولەیم و بەختەری کوڕی موجاهید موالی شەیبان.

کاتێك تورکەکان بەرێکەوتن، جونەید نەهار کوڕی تەوسعە (پیاوێك لەبەنی تیم اللات) و زبڵ کوڕی سوەیدی موری بۆ لای هوشام رەوانە کرد و بۆی نوسی: سورە نافەرمانی منی کرد، فەرمانم پێدابو لەکەناری رووبارەکە رێگە ببڕێت بەلآم ئەو کارەی نەکرد و هاوەلآنی لەدەوری بلآوبونەوە، دەستەیەکیان لەکێش هاتنە لای من و دەستەیەك ڕۆشتنە نەسەف و دەستەیەك روویان لەسەمەرقەند کرد و سورە لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی گیانیاندا.

هوشام چۆنیەتی روداوەکەی لەنەهار کوڕی تەوسعە پرسی. نەهار لەوەی بینیبوی، ئاگاداری کردەوە. هوشام بۆی نوسی: تۆم لەگەڵ دەهەزار شەڕکەر لەخەڵکانی کوفە و دە هەزار شەڕکەر لەخەڵکانی بەسرە رەوانە کرد و سی هەزار ڕمم بەتۆ بەخشی و بەم ئەندازەیە قەڵغانم پێدایت، بەخششی شەڕکەران جیابکەرەوە چونکە تۆ هیچ رێگرێت لەبەردەمدا نیە بۆ دیاری کردنی بەخششەکان لەنێوان پانزە هەزار کەس. کاتێك هوشام بیستی، سورە کوژراوە، وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتوین و بۆ لای ئەو دەگەرێینەوە

(بقره/ ٢/ ١٥٦) سوره لەخوراسان کوژرا و جەراح لەباب.

لەو رۆژەدا نەصر کوڕی سەیار ئازایانە شەڕی کرد. لەکاتی بونیان لەشێعب، پیاوێکی رەوانە کرد و وتی: بزانە خەڵکان چی دەڵێن و چۆن رۆژگار بەسەر دەبەن. رۆشت و گەڕایەوە و وتی: بینیم شادمانن و گیانیان پاك و خاوێن، هۆنراوەکان دەهۆننەوە و قورئان دەخوێنن. جونەید شادمان بو.

عوبەید کوڕی حاتەم کوڕی نوعمان دەڵێت: لەخەودا لەنێوان زەوی و ئاسمان خێوەتەکانم بینی و پرسیم: ئەمانە هی کێن؟ وتیان: عەبداللە کوڕی بێستام و هاورێکانی. بۆ بەیانی ئەو شەوە کوژران. پیاوێکی دیکە وتی: رۆژگارێك دوای ئەوە لەو شوێنە تێپەڕیم و هەستم بەبۆنی خۆش کرد.

جونەید لەسەمەرقەند مایەوە و خاقان بەرەو بوخارا بەرێکەوت کەقەتن کوڕی قوتەیبە کوڕی موسلیم فەرمانڕەوایەتی دەکرد. جونەید لەهێرشی تورکان بۆ سەر قەتن ترسا و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد. دەستەیەك وتیان: لەسەمەرقەند دادەبەزین. دەستەیەك وتیان: بەرێدەکەوین و دەڕۆینە رەبێنجەن و دواتر کێش و دواتر نەسەف و لەوێوە بۆ سەرزەمینی زەم ملی رێگە دەگرینەبەر و لەئامول دادەبەزین و رێگە لەخاقان دەگرین.

راوێژی لەگەڵ عەبداللە کوڕی ئەبی عەبداللە موالی بەنی سولەیم کرد و لەبۆچونەکانی ئەوان ئاگاداری کردەوە. عەبداللە بەڵێنی لێوەرگرت تا ناسازگاری بۆچونەکەی نەکات و ئەگەر فەرمانی بەرێکەوتن یا مانەوە بدات، بەکاری ببات. جونەید وتی: بەڵێن دەدەم. عەبداللە وتی: لەتۆم دەوێت چەند کارێك ئەنجام بدەیت. جونەید وتی: چ کارێك؟ عەبداللە وتی: لەهەر شوێنێك دابەزیت، بڕۆیتە ناو سەنگەر یا چاڵەکان، هەڵگرتنی ئاو لەبیر نەکەیت هەرچەند لەکەنار روباردا بیت و لەکاتی بەرێکەوتن و دابەزین گوێ لەفەرمانەکانی من بگریت. جونەید وتی: رازیم. عەبداللە وتی: ئەوەی کەپێیان وتویت لەسەمەرقەند بمێنیتەوە تا هێزە پشتیوانەکان بۆ هاوکاری تۆ بێن، هێزە پشتیوانەکان درەنگ دەگەن. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەرەوانە بون لەرێگەی کێش و نەسەف ئاماژەیان پێداوە، ئەگەر خەڵك لەلارێوە ببەیت، هێزی ئەوان تێکدەشکێنیت و لەبەرابەر دوژمنان لاوزایان دەکەیت و خاقان لەسەر تۆ بوێر دەبێت. ئەمڕۆ خاقان

مەبەستی شەر و گرتنی بوخارای کردوە بەڵام رێگەی بۆ ئەو کارە خۆش نەکردوە. ئەگەر لە لارێوە بەرێکەوێت، ئەم هەواڵە بەخەڵکی بوخارا دەگات وئەوان خۆیان تەسلیمی دوژمن دەکەن بەڵام ئەگەر لەشارێگەوە بەرێکەوێت، دوژمن لەتۆ دەترسێت. بۆچونی پەسەند لای من ئەوەیە ژنان و منداڵانی کوژراوانی هاورێی سورە هەڵبگریت و ئەوان بەسەر بنەماڵەکانیان دابەش بکەیت و لەگەڵ خۆت بیانبەیت چونکە بەئەنجامدانی ئەم کارانە هیوادارام خوا تۆ بەسەر دوژمناندا سەرکەوتو بکات، هەمو ئەو کەسانەی لەسەمەرقەند ماونەتەوە، یەکی هەزار درەم و ئەسپێکیان پێ ببەخشە.

جونەید بەپێی بۆچونەکانی ئەو بڕیارەکانی گرت و عوسمان کوڕی عەبداللە کوڕی شەخیری وەك جێگری خۆی لەسەمەرقەند دەستنیشان کرد و چوارسەد سوارە و چوارسەد پیادەی لای ئەو بەجێهێشت. خەڵك جوێنیان بەعەبداللە کوڕی ئەبی عەبداللەدا و وتیان: جگە لە لەناو بردنی ئێمە هیچ مەبەستێکی دیکەی نیە. جونەید بەرێکەوت و ژن و منداڵەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و ئەشحەب کوڕی عوبەیدی حەنزەلی لەگەڵ دەکەس لەپێشەنگەکان رەوانە کرد و وتی: کەگەشتیتە هەر مەنزڵێك، یەکێك لەپیاوەکانت بۆلای من دەگەڕێنیتەوە تا لەبارودۆخ ئاگادارم بکاتەوە. جونەید بەرێکەوت و پەلەی کرد. عەتای دەبوسی پێی وت: بزانە پیرترین پیاوی سوپاکە کێیە، جل و بەرگی سەراسەری شەڕی لەبەر بکە و شمشێر و قەڵغان و تیروکەوانی پێ ببەخشە و لەگەڵ ئەودا هەنگاو هەڵبگرە. چونکە ئێمە کەپیادەین توانایی خێرا ڕۆشتن و شەڕکردنی چالاکانەمان نیە. جونەید ئەو کارەی کرد. هیچ پێشهاتێك رووی نەدا تا لەشوێنە مەترسیدارەکان گوزەریان کرد و جونەید گەیشتە نزیکی تەواویس. خاقان لەرۆژی یەکەمی مانگی رەمەزان/ ١٧ نۆڤەمبەری ٧٣٠ زایینی لە کرمینیە روبەروی بویەوە و شەڕ دەستی پێکرد. عەبداللە کوڕی ئەبی عەبداللە دەم بەبزە هاتە لای. جونەید وتی: ئێستا کاتی پێکەنین نیە. عەبداللە وتی: سوپاس بۆ خوا کە لەکوێستانەکان و دەشتە مەترسیدارەکان رووبەرووی تۆ نەبونەوە، بەڵکو کاتێك رووبەرووی تۆ بونەوە کە لەناو سەنگەردایت و رۆژ بەرەو کۆتایی دەڕوات و ئەوان هیلاك و شەکەت و تۆ بەهێز و بەتوانایت. ماوەیەك شەڕیان کرد و دواتر گەڕانەوە. دواتر بەجونەیدی وت: کۆچ بکە چونکە خاقان دەیەوێت تۆ بمێنیتەوە بۆ ئەوەی هەر

کاتێك ویستی هێرش بکاتە سەر تۆ.

بەرێکەوت و عەبدالله فەرماندەیی کۆتایی سوپاکەی لەئەستۆ گرت. دواتر فەرمانی بەجونەیددا دابەزێت و دابەزی. عەبدالله وتی: گومان دەکەم خاقان زیان بەکۆتایی سوپاکە بگەیێنێت و ئەمڕۆ هێرش بکاتە سەریان. بە شەرکەرە بەئەزمونەکان بەهێزیان بکە. جونەید ئەوانی بەهێز کرد. تورکەکان هاتن و هێرشیان کردە سەر کۆتایی سوپاکە و شەڕیان کرد. شەڕ رووی لەدژواری کرد و موسلیم کوڕی ئەحوەز یەکێك لەگەورەکانی تورکی کوشت. تورکەکان کوژرانی ئەویان بەخراپ لێکدایەوە و لەتەواویس گەڕانەوە و موسوڵمانان بەرێکەوتن و رۆژی مێهرگان/ ٨ ئۆکتۆبەری ٧٣٠ زایینی ڕۆشتنە ناو بوخارا. خەڵك بە درەمی بوخارایی پێشوازیان لێکردن و ئەو دە بەدە بەوانی بەخشی.

عەبدولمونمین کوڕی خالید دەڵێت: دوای مەرگی عەبدالله کوڕی ئەبی عەبدالله ئەوم لەخەودا بینی کەدەیوت: زبدة من الزبد، صنبور من صنبور، قل من قل، هیفة من الهیف. هیفە کەمتیارە، قول مەیمونە، صەنبور ئەوەیە کە برای نیە یا لای بنەماڵەیەکی دیکە دەژیت.

سوپایەك لەکوفەوە بۆ هاوکاری جونەید گەیشت. ئەو حەوسەرە کوڕی زەیدی عەنبەری و خۆبەخشەکانی لەگەڵ ئەوان رەوانە کرد. دەستەیەك دەڵێن: شەڕی شێعب لەساڵی ١١٣/ ٧٣١ زایینی رویدا. نەصر کوڕی سەیار بۆ بیرەوەری شەڕی شێعب وتی:

| | |
|---|---|
| انی نشات و حسادی ذوو عدد | یاذا المعارج لا تنقص لهم عددا |
| ان تحسدونی علی مثل البالاء لکم | یوما فمثل بلائی جر لی الحسدا |
| یابی الاله الذی اعلی بقدرته | کعبی علیکم و اعطی فوقکم عددا |
| ارمی العداة بافراس مکلمة | حتی اتخذن علی حسادهن یدا |
| من ذا الذی منکم فی الشعب اذوردوا | لم یتخذ حومة الاثقال معتمدا |
| هلا شهدتم دفاعی عن جنیدکم | وقع القنا و شهاب الحرب قد وقدا |

یانی: من گەورە بوم و گەشەم کرد و رژدی بەرانم لەژمارەدا فراوان بون، ئەی خوای بەخشەری پێگەکان، ژمارەی ئەوان کەم بکەرەوە. ئەگەر بۆ شەرێك هاوشێوەی شەڕی ئێوە رۆژێك لەرۆژان رژدی بەمن ببەن، کەسێکی وەك من بەو شەڕە ئازایانەی دەیکات، رژدی کەسانی دیکە دەبزوێنێت. ئەو خوایەیی بەهێزی خۆی لەپێشی پێبڕا، جگە لەوەی

ناوێت کە ڕمەکەی ئێمە لەڕمەکانی ئێوە سەرفرازتر بێت و توێشو و توانا و کەل و پەلی شەڕی من لەئێوە زیاتر بێت. دوژمنەکان سوار لەسەر ئەسپە زین کراوەکان لەناو دەبەم تا بەسەر دوژمنە رژدی بەرەکان زاڵ ببن و سەرکەوتن بەدەست بێنن. کام یەك لەئێوە لەکاتی هاتنی ئەوان بۆ شێعب لەوێ بوو؟ کام یەك لەئێوە بو کەزین و کۆپان وکاڵاکانی خۆی نەکردە پەناگە؟ بۆ بەرگری کردنی منتان لەجونەید نەبینی کەرمەکان دادەبارین و بڵێسەی ئاگر لەهەر چوار لاوە بۆ ئاسمان بەرز دەبویەوە.

کوڕی عەریس بۆ وەسف کردنی نەصر وتی:

| | |
|---|---|
| یا نصر انت فتی نزار کلها | فلك الماثر و الفعال الا رفع |
| فرجت عن کل القبائل کربة | بالشعب حین تخاضعوا و تضعضوا |
| یوم الجنید اذا القنا متشاحر | و النحر دام و الخوافق تلمع |
| مازلت ترمیهم بنفس حرة | حتی تفرج جمعهم و تصدعوا |
| فالناس کل بعدها عتقائکم | و لك المکارم و المعالی اجمع |

یانی: ئەی نەصر، تۆ جوامێر و سەروەری هەمو خەڵکانی نەزاریت. ڕێزداریەکان لەتۆدا کۆبونەوە و باشترین کارەکان تۆ ڕێکیان دەخەیت. خەمت لەسەر شانی هەمو بنەماڵەکان هەلگرت و ئەمە لەرۆژی شەڕی (دۆڵ) بوو کەهەموان سەریان دانەواند و لەرزان. رۆژی جونەید کەرمەکان لەیەك گیریان کرد و خوێن لەقورگەکان دەباری و ئاڵا سورەکان دەشەکانەوە. بەردەوام بەگیانێکی پاك و ئازاد ئەوانت لەناو دەبرد تا ریزەکانیان تێکشکا و لەیەك پچڕان. دوای ئەوە هەمو خەڵکان ئازادبوەکانی دەستی ئێوەن و پێگەی لەپێشی و ڕێزداریەکان تایبەتە بەتۆ.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام لەهاویندا شەڕی کرد و دەستی بەسەر خەرشەنەدا گرت.

ئیبراهیم کوڕی هوشامی مەخزومی ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. بەوتەی دەستەیەك سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولەلیك ئایینی حەجی ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا دوای مردنی هەیسەم، ئانۆدلۆسیەکان فەرماندەکەیان محەممەد کوڕی عەبدولەلیکی ئەشجەعیان کردە فەرمانڕەوایی خۆیان. دو مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد و

دوای ئەو دج کوڕی عەبدالله غافقی هاتەسەر کار.

کارگوزاران لەم ساڵەدا هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: رەجا ءکوڕی حەیوە لە قوسەین، مەکحول ئەبو عەبدالله شامی فەقیە، عەبدولجەبار کوڕی وایل کوڕی حوجری حەزرەمی. باوکی کاتێك مرد کەدایکی بەم دوگیان بوو. هەرچی لەباوکی دەگێڕنەوە، پچڕاوە و پچڕپچڕە.

## ڕوداوەکانی ساڵی سەد و سیانزەی کۆچی ( ٧٣١ زایینی )

## کوژرانی عەبدولوەهاب

لەم ساڵەدا عەبدولوەهاب کوڕی بوخت کوژرا. ئەو هاوڕێ لەگەڵ عەبداللە بەتاڵ بۆ شەڕ لەسەرزەمینی ڕۆم ڕۆشتبوو. خەڵك لەدەوری بەتاڵ بڵاوەیان لێکرد و عەبدولوەهاب هێرشی دەبرد و بەردەوام دەیوت: ئەسپێکی لاوازتر لەتۆم نەبینیوە، خوا خوێنم بڕێژێت ئەگەر خوێنت نەڕێژم! دواتر خودەی هەڵگرت و فڕێیدا و وتی: من عەبدولوەهاب کوڕی بوختم! ئایا لەبەهەشت رادەکەن؟ دواتر بەرەو رووی دوژمن پێشڕەوی کرد و لای پیاوێك تێپەڕی کەدەیوت: ئەی هاوار لەتینویەتیدا مردم! وتی: پێشڕەوی بکە چونکە ئاوی فراوان (لەبەهەشت) چاوەڕێت دەکات. لەگەڵ ئەو پیاوە هێرشی بردە کەکوژرا و ئەسپەکەیشی کوژرا.

## شەڕی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك و گەڕانەوەی ئەو

لەم ساڵەدا مەسلەمە سوپاکەی لەسەرزەمینی خاقان بڵاو کردەوە و دەستی بەسەر قەڵا و شارەکاندا گرت و خەڵکانی ئەسیر و کۆیلەی کرد و سوتاندی و ئەو دیو کوێستانەکانی بەلەنجەر بەتەواوەتی دەستەمۆی بوون و کوڕی خاقان کوژرا. هەمووی ئەو خەڵکە لەخەزەرەکان و کەسانی دیکە کۆبونەوە و سوپایەکیان تەیار کرد کەژمارەکەیان جگە لەخوای گەورە کەس نەیدەزانی. مەسلەمە لەبەلەنجەر تێپەڕیبوو. کاتێك ئەم هەواڵە بەمەسلەمە گەیشت، فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا کەچەندین ئاگری گەورەیان کردەوە. ئەوسا خێوەت و باروبنەی خۆیان بەجێهێشت و بارسووك گەڕانەوە و ناتەوانانی لەپێشەوە ڕەوانە کرد و بەهێز و بوێرەکانی بەدوای ئەواندا و مەنزڵ و ڕێگاکانی بڕی تا ئەوەی نیوە گیان گەیشتنە شارەکانی باب و ئەبواب.

## کوژرانی عەبدولرەحمان فەرمانداری ئاندۆلۆس

فەرمانداری عەبدولمەلیك کوڕی قەتەن

لەم ساڵەدا (٧٣١/١١٣) عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله غافقی فەرمانداری ئاندۆلۆس (لەلایەن عوبەیدە کوڕی عەبدولرەحمانی سولەمی) بەمەبەستی شەڕ ڕۆشتەدەر. هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، لەساڵی ١١٠/ ٧٢٨ زایینی عوبەیدەی وەك فەرمانداری ئەفریقیە و ئاندۆلۆس دەستنیشان کردبو. کاتێك گەیشتە ئەفریقیە، موستەنیر کوڕی حارسی حورەیسی بۆ شەڕ لەسیسیل ڕەوانە کرد. لەوێ مایەوە تا زستان تەنگی پێ هەڵچنی، دواتر گەڕایەوە و سوپاکەی لەئاودا خنکان و موستەنیر و چوارپێکەی ڕزگاریان بوو. عوبەیدە لەسزای ئەم کارەیدا خستیە زیندان و قامچی لێدا و لەسوچ و قوژبنەکانی قیروان بەریسوایی و لاوازی سوڕاندییەوە.

عوبەیدە، عەبدولرەحمان کوڕی عەبدالله وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس دەستنیشان کرد کەبۆ شەڕی فەرەنگەکان ڕۆشتەدەر و لەقووڵایی وڵاتی ئەوان پێشڕەوی کرد و تاڵانی زۆری دەسکەوت کە لەناویاندا قاچێکی زێرینی ڕازاوە بەیاقوت و گەوهەر و زەمورود دەبینرا. قاچەکەی شکاند و لەناو خەڵکدا دابەشی کرد. هەواڵی کارەکەی بەعوبەیدە گەیشت کەتوڕە بوو و نامەی بۆنوسی و ئاگاداری کردەوە. عەبدولرەحمان کەپیاوێکی چاکەکار بو، وەڵامی دایەوە: دوای سڵاو، ئەگەر زەوی و ئاسمانەکان هەموویان داخرابێتن، خوای گەورە بۆ چاکەکاران ڕێگەیەکی چوونەدەرەوە ئامادە دەکات. دواتر لەم ساڵەدا یا ساڵی ١١٤/ ٧٣٢ زایینی بەمەبەستی شەڕ لەسەرزەمینی فەرەنگەکان ڕەوانە بوو. خۆی و هاوڕێکانی لەم ڕێگادا گیانیان سپارد.

دواتر عوبەیدە لەئەفریقیەوە ڕوی کردە شام و لەگەڵ خۆی کاڵای فراوان و دیاری گرانبایی و کەنیز و کۆیلە و چوارپێی و شتی دیکەی بۆ هوشام برد و داوای لێکرد لەفەرمانڕەوایەتی دووری بخاتەوە. هوشام ڕازی بو و ئەوی لەسەر کارلابرد. ئەو پێش کوژرانی عەبدولرەحمان، عەبدولمەلیك کوڕی قەتەنی وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس دەستنیشان کردبو.

هوشام دوای عوبەیدە، عوبەیدالله کوڕی حەبابی وەك فەرمانڕەوایی ئەفریقیە دەستنیشان کرد. ئەو پێشتر فەرمانداری میسر بوو. عوبەیدالله لەساڵی ١١٦/ ٧٣٤ زایینی

ڕۆشتە ئەفریقیە و موستەنیر کوڕی حارسی لەزیندان ئازاد کرد و فەرمانداری تونسی پێ بەخشی.

عوبەیدە سوپایەکی بەفەرماندەیی حەبیب کوڕی ئەبی عوبەیدە بەرەو سەرزەمینی سودان ڕەوانە کرد. ئەو چەندین سەرکەوتنی بەدەست هێنا کەهیچ کەس تا ئەوکاتە بەدەستی نەهێنابو. هەرچی دەیویست وەك تالآنی هەڵیگرت و دواتر لەدەریا شەڕی کرد و گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕوداوێك

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەدی کوڕی سابتی ئەنساری، معاویە کوڕی قورە کوڕی ئەیاسی موزەنی باوکی ئەیاس (دادیاری بەسرە کەهوشیاری ئەو بەنمونە دەهێننەوە) حەرام کوڕی سەعید کوڕی موحەیصە ئەبو سەعید لەتەمەنی ٧٠ ساڵی، تەڵحە کوڕی موصرەف ئەیامی، عەبداللە کوڕی عوبەیداللە کوڕی عومەیری لەیسی، عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی سەعیدی خودری بەنازناوی ئەبوجەعفەر لەتەمەنی ٧٧ ساڵی، وەهب کوڕی مونەبەی صەنعانی کە لەبراکەی هوشام بچوکتر و چواربرای هەبو بەناوەکانی: هەمام و غەیلان و عەقیل و مەعقەل کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١١٠/ ٧٢٨ زایینی کۆچی دوایی کرد. حوڕ کوڕی یوسف کارگوزاری موسڵ کە لەئارمگای قورەیشیەکان لەم شارەدا بەخاك سپێردرا و ئەم گۆڕستانە ڕووبەری ماڵە جوانەکەی بەناوی (نەخشێنراو) بوو و لە زی حەججە/ فەوریەی ٧٣٢ زایینی کۆچی دوایی کرد. هوشام لەجێگەی ئەو وەلید کوڕی تەلیدی عەبسی دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدا بۆ تەواو کردنی ئاوەڕێیی شارەکە هەوڵ بدات. ئەو هەوڵیدا و گرنگی و بەهای تایبەتی بۆ ئەو کارە تەرخان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام لەسەرزەمینی ڕۆم شەڕی کرد. لەپانتایی مەرعەش خەڵکی کۆکردەوە و دواتر گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەبانگەشەکەران بۆ بەنی عەباس ڕۆشتنە خوراسان. جونەید یەکێك لەوانی گرت و کوشتی و وتی: هەرکەس بگرم، خوێنی دەرێژم.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. دەستەیەك دەڵێن: ئیبراهیم کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیل ئەو کارەی کرد.

کارگوزاران هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون.

## ڕووداوەكانی ساڵی سەد و چواردەی كۆچی ( ٧٣٢ زایینی )

فەرمانداری مەروان كوڕی محەممەد لە ئەرمەنستان و ئازەربایەجان

لەم ساڵەدا هوشام كوڕی عەبدولمەلیك، مەروان كوڕی محەممەد كوڕە مامی خۆی وەك فەرمانداری ئازەربایەجان و ئەرمەنستان دەسنیشان كرد.

هۆكاری ئەم كارە ئەوە بو، ئەو لەسوپاكەی مەسلەمە لەئەرمەنستان لەكاتی شەڕ لەگەڵ خەزەرەكان بەشداری كرد. كاتێك مەسلەمە گەڕایەوە، مەروان ڕۆشتە لای هوشام و هوشام پێش ئەوەی ئاگادار بكرێتەوە، مەروانی لەبەرابەر خۆی بینی. پرسی كەبۆ هاتویت. وتی: لەوەی بینیم، بێزار بوم و جگە لەخۆم پەیكێكی شیاوم نەبینی تا ئەم هەواڵە بەتۆ بگەیەنێت. وتی: چیە؟ مەروان وتی: هاتنی خەزەرەكان بۆ سەرزەمینی موسوڵمانان و كوژرانی جەراح و كەسانیتر، پێشهاتێك بوو زیانی گەورەی بەموسوڵمانان گەیاند و ئەوانی ناتەوان كرد. دواتر سەروەری باوەڕداران بەباشی زانی كە مەسلەمە كوڕی عەبدولمەلیك بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە بكات. سوێند بەخوا لەشارەكانی ئەوان تەنیا كەم بەها و ناگرینگەكانی ئەوانی لەژێر سمی ئەسپەكانی خۆی شێلا و پێشێلی كرد. كاتێك فراوانی سوپاكەی خۆی بینی، شادمان بو و پەیامی بۆ خەزەرەكان نارد و بۆ شەڕ ئاگاداری پێدان و كاتێك گەیشتە سەرزەمینی ئەوان، زیانێكی ئەوتۆی لەوان نەدا و گرنگترین كارو هونەری ئەوە بو كەتەندروست، خۆی رزگاری كرد. من دەمەوێت فەرمانی جەنگ بەمن بدەیت تا تۆڵە بستێنمەوە و ئەم نەنگ و شەرمە لەناوچاوی خۆمان بسڕمەوە. هوشام وتی: ئەو فەرمانەت پێ دەدەم. وتی: سەد هەزار پیاوی شەڕكەر بكەرە هاوڕێی من. وتی: كردم. وتی: ئەم نهێنیە لای كەس مەدركێنە. وتی: كردم و تۆم كردە فەرمانداری ئەرمەنستان.

ماڵئاوایی لێكرد و مەروان بوبە فەرمانداری ئەرمەنستان و بەرێكەوت. هوشام سوپایەكی لەشام و عێراق و جەزیرەوە ڕەوانە كرد. لای ئەو لەشەڕكەران و خۆبەخشەكان نزیكەی سەد و بیست هەزار پیاوی شەڕكەر كۆبونەوە. وای نیشاندا مەبەستی ئەوەی هەیە بڕواتە لان و لەسەرزەمینەكەیان شەڕیان لەگەڵ ئەزمون بكات.

کەسی بۆ لای پاشای خەزەرەکان رەوانە کرد و خوازیاری ئاگربڕ بوو. پاشای خەزەرەکان رازی بوو و کەسی رەوانە کرد تا پەیمانی ئاشتیەکە مۆر بکات. ئەو نێردراوەکەی لای خۆی هێشتەوە تا لەئامادە کردن و تەیار کردنی سوپاکەی تەواو بو. دواتر بەتوندی قسەی لەگەڵ ئەوان کرد و بۆ شەڕ ئاگاداری پێدان و نێردراوەکەی گەڕاندەوە. کەسێکی کردە هاورێی تا لەدوورترین رێگاوە بڕوات. خۆی لەنزیکترین رێگاوە بەرێکەوت. نێردراوە نەگەشتە لای پاشاکەیان کەمەروان گەیشتە سەریان. نێردراو پاشاکەی خۆی لەئامادەیی سوپاکەی مەروان ئاگادار کردەوە و هەمو هەواڵەکانی پێدا. پاشای خەزەرەکان لەگەڵ هاوەلآتی خۆی راوێژی کرد. وتیان: ئەم عەرەبە تۆی فریودا و هاتۆتە ناو ولآتەکەی تۆ. ئەگەر لەشوێنەکەی خۆت بمێنیتەوە و سەرقاڵی ئامادە کردن و تەیار کردنی سوپاکەت بیت، دەرفەتی ئەو کارەت پێ نابڕێت، ئەگەر بەشێوەی ئێستا رووبەرووی ببیتەوە و شەڕ بکەیت، بەسەر تۆدا سەردەکەوێت و هێزی تۆ لەناو دەبات. بۆچونی راست ئەوەیە بۆ شارە دوورەکانی ولآتەکەت پاشەکشێ بکەیت و رێگەی بۆ بکەیتەوە تا هەر کارێك دەیەوێت ئەنجامی بدات. بەبۆچونەکەیان رازی بو و ڕۆشتە ئەو شوێنەی کەپێشنیاریان کرد.

مەروان ڕۆشتە ناو ولآتەکەی ئەوان و لەقوولآییەکاندا پێشڕەوی کرد و سەراسەر وێران و خاپوری کرد و تالآنی و ئەسیرەکانی کۆکردەوە. گەیشتە کۆتایی سەرزەمینەکە و تۆڵەی خۆی سەندەوە و چەند رۆژێك مایەوە تا ئەوەی هەمویانی ملکەچی فەرمانەکانی خۆی کرد. ڕۆشتە ولآتی پاشای تاجدار و وێرانی کرد، دەستی بەسەر قەلآکاندا گرت و پاشا تەسلیمی بو و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست لەسەر ئەو بنەمای کە هەزار وپێنسەد کۆیلەی پیاو و پێنسەد کەنیزی موو ڕەش و سەد هەزار پەیمانەی پێ ببەخشێت و هەمووی بباتە شاری باب. مەروان لەگەڵ کۆمەلآنی خەڵك لەسەر بنەمای وەرگرتنی سەد سەر (مەڕومالآت) پەیمانی بەست. دواتر ڕۆشتە ناو سەرزەمینی زێریکێران و لەگەڵ پاشاکەی پەیمانی ئاشتی بەست و دواتر بەرەو ولآتی حەمزین ملی رێگەی گرتەبەر کەپاشاکەی تەسلیم نەبوو و مەروان گەمارۆی خستە سەر قەلآکەیان و دەستی بەسەردا گرت و لەوێوە رەوانەی سەغد و بەئاشتی دەستی بەسەردا گرت و فەرمانی بە(تەبەر شان شا)دا سالآنە بیست هەزار پەیمانەی بۆ ببات بۆ شاری باب. دواتر لای

قەڵای پاشای لەکز دابەزی کە لەدانی باج خۆی بەدوور دەگرت. پاشا هاتەدەر و مەبەستی دەرباری پاشای خەزەرەکانی کرد بەڵام شوانێك بێ ئەوەی بیناسێت تیرێکی بۆ هاویشت و کوشتی. خەڵکی لەکز لەگەڵ مەروان ئاشتیان کرد و ئەو فەرمانداریکی بۆ دەستنیشان کردن و بەرەو قەڵای شروان لەکەنار دەریا بەرێکەوت کەهەمویان ملکەچی فەرمانەکانی بوون. سەرئەنجام گەیشتە دودانیە و کوشتاری خەڵکەکەی کرد و گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند روداوێك

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام لەهاویندا لەلای چەپ شەڕی کرد و دەستی بەسەر ئاغێلەکانی ئەقرەندا گرت. عەبدالله بەتاڵ لەگەڵ سوپایەك لەموسوڵمانان، رووبەرووی کۆنستانتین بویەوە و شەڕی کردو شکستی پێهێنا و چەندین کەسی ئەسیر کرد. هەروەها لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی هوشام لەوەرزی هاوین شەڕی کرد و گەیشتە کایسارسا (قیساریە).

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولەلیك، ئیبراهیم کوڕی هوشامی مەخزومی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و خالید کوڕی عەبدولەلیك کوڕی حارس کوڕی حەکەمی لەمانگی رەبیع الاول/ مەی ٧٣٢ زایینی لەجێگەی ئەودانا. رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئیبراهیم هەشت ساڵی خایاند. هەروەها فەرمانداری مەککە و تاییفی لەئیبراهیم وەرگرتەوە و بۆ ئەم دوشارە محەممەد کوڕی هوشامی مەخزومی دەستنیشان کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نیە بەڵکو بۆ ماوەی سیانزە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و کاتێك ئیبراهیم لەسەر کار لابرا، محەممەد بۆ جێگەکەی دەستنیشان کرا. لەم ساڵەدا تاعون لەواست بڵاوبویەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك گەڕایەوە و ئەمە لەدوای ئەوە بو کەخاقانی شکستدا و کارەکانی ئەو دیارەی رێکخست و بناغەی شاری بابی دارِشت.

لەم ساڵەدا خالید کوڕی عەبدولەلیك کوڕی حارس ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. کارگوزاران هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون کەئاماژەیان پێدرا جگە لەوەی کەخالید کوڕی عەبدولەلیك فەرمانداری مەدینە بو و تایف و مەککە محەممەد کوڕی هوشام و ئەرمەنستان و ئازەربایەجان لەژێر فەرمانڕەوایەتی مەروان کوڕی محەممەددا بو.

کەسی بۆ لای پاشای خەزەرەکان رەوانە کرد و خوازیاری ئاگربڕ بوو. پاشای خەزەرەکان رازی بوو و کەسی رەوانە کرد تا پەیمانی ئاشتیەکە مۆر بکات. ئەو نێردراوەکەی لای خۆی هێشتەوە تا لەئامادە کردن و تەیار کردنی سوپاکەی تەواو بو. دواتر بەتوندی قسەی لەگەڵ ئەوان کرد و بۆ شەڕ ئاگاداری پێدان و نێردراوەکەی گەڕاندەوە. کەسێکی کردە هاورێی تا لەدوورترین رێگاوە بڕوات. خۆی لەنزیکترین رێگاوە بەرێکەوت. نێردراوە نەگەشتە لای پاشاکەیان کەمەروان گەیشتە سەریان. نێردراو پاشاکەی خۆی لەئامادەیی سوپاکەی مەروان ئاگادار کردەوە و هەمو هەواڵەکانی پێدا. پاشای خەزەرەکان لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد. وتیان: ئەم عەرەبە تۆی فریودا و هاتۆتە ناو وڵاتەکەی تۆ. ئەگەر لەشوێنەکەی خۆت بمێنیتەوە و سەرقاڵی ئامادە کردن و تەیار کردنی سوپاکەت بیت، دەرفەتی ئەو کارەت پێ نابڕێت، ئەگەر بەشێوەی ئێستا رووبەرووی ببیتەوە و شەڕ بکەیت، بەسەر تۆدا سەردەکەوێت و هێزی تۆ لەناو دەبات. بۆچونی راست ئەوەیە بۆ شارە دوورەکانی وڵاتەکەت پاشەکشێ بکەیت و رێگەی بۆ بکەیتەوە تا هەر کارێك دەیەوێت ئەنجامی بدات. بەبۆچونەکەیان رازی بو و ڕۆشتە ئەو شوێنەی کەپێشنیاریان کرد.

مەروان ڕۆشتە ناو وڵاتەکەی ئەوان و لەقووڵاییەکاندا پێشڕەوی کرد و سەراسەر وێران و خاپوری کرد و تاڵانی و ئەسیرەکانی کۆکردەوە. گەیشتە کۆتایی سەرزەمینەکە و تۆڵەی خۆی سەندەوە و چەند رۆژێك مایەوە تا ئەوەی هەموویانی ملکەچی فەرمانەکانی خۆی کرد. ڕۆشتە وڵاتی پاشای تاجدار و وێرانی کرد، دەستی بەسەر قەڵاکاندا گرت و پاشا تەسلیمی بو و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست لەسەر ئەو بنەمای کە هەزار وپێنسەد کۆیلەی پیاو و پێنسەد کەنیزی موو ڕەش و سەد هەزار پەیمانەی پێ ببەخشێت و هەمووی بباتە شاری باب. مەروان لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵك لەسەر بنەمای وەرگرتنی سەد سەر (مەڕومالآت) پەیمانی بەست. دواتر ڕۆشتە ناو سەرزەمینی زێریکێران و لەگەڵ پاشاکەی پەیمانی ئاشتی بەست و دواتر بەرەو وڵاتی حەمزین ملی رێگەی گرتەبەر کەپاشاکەی تەسلیم نەبوو و مەروان گەمارۆی خستە سەر قەڵاکەیان و دەستی بەسەردا گرت و لەوێوە رەوانەی سەغد و بەئاشتی دەستی بەسەردا گرت و فەرمانی بە(تەبەر شان شا)دا ساڵانە بیست هەزار پەیمانەی بۆ ببات بۆ شاری باب. دواتر لای

قەڵای پاشای لەکز دابەزی کە لەدانی باج خۆی بەدوور دەگرت. پاشا هاتەدەر و مەبەستی دەرباری پاشای خەزەرەکانی کرد بەڵام شوانێك بێ ئەوەی بیناسێت تیرێکی بۆ هاویشت و کوشتی. خەڵکی لەکز لەگەڵ مەروان ئاشتیان کرد و ئەو فەرمانداریێکی بۆ دەستنیشان کردن و بەرەو قەڵای شروان لەکەنار دەریا بەرێکەوت کەهەمویان ملکەچی فەرمانەکانی بوون. سەرئەنجام گەیشتە دودانیە و کوشتاری خەڵکەکەی کرد و گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام لەهاویندا لەلای چەپ شەڕی کرد و دەستی بەسەر ئاغێلەکانی ئەقرەندا گرت. عەبداللە بەتاڵ لەگەڵ سوپایەك لەموسوڵمانان، رووبەرووی کۆنستانتین بویەوە و شەڕی کردو شکستی پێهێنا و چەندین کەسی ئەسیر کرد. هەروەها لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی هوشام لەوەرزی هاوین شەڕی کرد و گەیشتە کایسارسا (قیساریە).

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، ئیبراهیم کوڕی هوشامی مەخزومی لەفەرمانداری مەدینە لابرد و خالید کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی حارس کوڕی حەکەمی لەمانگی رەبیع الاول/ مەی ٧٣٢ زایینی لەجێگەی ئەودانا. رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئیبراهیم هەشت ساڵی خایاند. هەروەها فەرمانداری مەککە و تاییفی لەئیبراهیم وەرگرتەوە و بۆ ئەم دوشارە محەممەد کوڕی هوشامی مەخزومی دەستنیشان کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نیە بەڵکو بۆ ماوەی سیانزە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و کاتێك ئیبراهیم لەسەر کار لابرا، محەممەد بۆ جێگەکەی دەستنیشان کرا. لەم ساڵەدا تاعون لەواست بڵاوبویەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك گەڕایەوە و ئەمە لەدوای ئەوە بو کەخاقانی شکستدا و کارەکانی ئەو دیارەی رێکخست و بناغەی شاری بابی داڕشت.

لەم ساڵەدا خالید کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی حارس ئاییتی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. کارگوزاران هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون کەئاماژەیان پێدرا جگە لەوەی کەخالید کوڕی عەبدولمەلیك فەرمانداری مەدینە بو و تایف و مەککە محەممەد کوڕی هوشام و ئەرمەنستان و ئازەربایەجان لەژێر فەرمانڕەوایەتی مەروان کوڕی محەممەددا بو.

ئەم كەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەتا كوڕی ئەبی رياح كەدەستەيەك دەڵێن: لەساڵی ١١٥/ ٧٣٣ زايينی كۆچی دوايی كرد و ساڵەكانی تەمەنی ٨٨ ساڵ بوو و دەستەيەك دەڵێن: لەساڵی ١٠٠/ ٧١٨ زايينی مرد، محەممەد كوڕی عەلی كوڕی حسين باقر كەدەستەيەك دەڵێن: لەساڵی ١١٥/ ٧٣٣ زايينی مرد و ساڵەكانی تەمەنی ٧٣ يا ٥٨ ساڵ درێژەی كێشا، حەكەم كوڕی عوتەيبە كوڕی ئەهاس ئەبو محەممەد موالی ژنێك لەكێندە كە لەساڵی ٥٠/ ٦٧٠ زايينی چاوی بەدنيا هەڵهێنا، عەبدالله كوڕی بەريدە كوڕی حوصەيبی ئەسلەمی داديارى مەرو كە سێ ساڵ دوای دەست بەكاربوونی عومەر كوڕی خەتاب چاوی بەدنيا هەڵهێنا.

## ڕوداوەكانی ساڵی سەد و پانزەی كۆچی ( ٧٣٣ زايينی )

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی هوشام لەسەرزەمينی ڕۆم شەڕی كرد و هەروەها لەم ساڵەدا تاعوون لەشام بڵاوبويەوە و لەخوراسان قاتوقڕی و وشكەساڵی ڕوويدا. جونەيد نامەی بۆ شارەكان نوسی تا خواردن بۆ مەرو ببەن. جونەيد دو دەرەمی بە پياوێكدا كە نانێكی پێ كڕی. بەوانی وت: نانێك بەدرەمێكە و ئێوە لەبرسانا دەناڵێنن؟ خۆم لەهيندستان بينيم كە دەنكێ گەنم بەدەرمێك بو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی هوشامی مەخزومی ئايينی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. فەرمانداری خوراسان جونەيد بو. دەستەيەك دەڵێن: بەمشێوە نيە بەڵكو جونەيد مردبوو و عومارە كوڕی حورەيمی موری فەرماندار بوو. دەستەيەك دەڵێن: جونەيد لەساڵی ١١٦/ ٧٣٤ زايينی مرد.

لەم ساڵەدا عەبدولەليك كوڕی قەتەن فەرمانداری ئاندۆلۆس لەسەرزەمينی بشكەنەس شەڕی كرد و تەندروست گەڕايەوە.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی هەشتەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٠

# پێڕست

## ڕووداوەکانیساڵی سەد و شانزەیەمی کۆچی (( ٧٣٤ زایینی ))

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی عەبدولمەلیك لەهاویندا لەسەرزەمینی ڕۆم شەڕی کرد. هەروەها لەم ساڵەدا تاعوون باڵی بەسەر عێراق و شامدا کێشا و لەواست بەشێوەیەکی مەترسیدارتر دەرکەوت.

## لەسەر کار لابردنی جونەید و مەرگی ئەو فەرمانداری عاسم لەخوراسان

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، جونەید کوڕی عەبدولرەحمانی موڕی لەفەرمانڕەوای خوراسان لابرد و عاسم کوڕی عەبدوالله کوڕی یەزیدی هیلالی لەجێگەی ئەودانا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبوو کەجونەید لەگەڵ فاتیمە کچی یەزید کوڕی موهەلیب پەیوەندی هاسەرگیری بەست. هوشام لەم کارە توڕە و جونەیدی لەفەرمانڕەوایی خوراسان دوورخستەوە. سکی جونەید ئاوی کردبوو، هوشام بەعاسمی وت: ئەگەر ئەوت بەنیوە گیانی بینی، گیانی بگرە. عاسم کاتێك گەیشت کەجونەید مردبوو. دوژمنایەتی دێرینە لەنێوان ئەم دووانە بوونی بوو. عومارە کوڕی حورەیمی گرت کەکاربەدەستی جونەید و کوڕە مامی بوو. عاسم ئەو و هەموو کاربەدەستانی جونەیدی ئەشکەنجە کرد.

جونەید لەشاری مەرو مرد. کەسێکی بەخشەر و شاعیرەکان وەسفیان دەکرد و جونەید زێڕ و زیوی لەناو ئەواندا دەبەخشییەوە. بەڵام نەیدەتوانی لەشەڕەکاندا سەرکەوتن بەدەست بێنێت.

## سەرکێشی حارس کوڕی سورەیح لەخوراسان

لەم ساڵەدا حارس کوڕی سورەیح شۆڕشی کرد و رووی کردە فاریاب. عاسم کوڕی عەبدوالله چەندین کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد کە لەناو ئەوان موقاتیل کوڕی حەییانی نەبتی و حەتاب کوڕی موحرەزی سولەمی دەبینران. ئەم دووانە بەهاوڕێکانی خۆیانیان وت: تەنیا کاتێك ئەمانمان پێ ببەخشێت، چاومان بەحارس دەکەوێت. خەڵکان

رازی نەبوون و حارس ئەوانی گرت و زیندانی کردن وپیاوێکی بۆ پاسەوانی کردنی ئەوان دانا. ئەوان پیاوەکەیان گرت و بەستیانەوە و لەزیندان هاتنەدەر. سوار بوون و ڕۆشتنە لای عاسم. فەرمانی پێدان و ڕۆشتنە سەر تەختی وتاردان و خراپەی حارسیان هێنایە سەرزمان و سەرکۆنەیان کرد و خراپەکاری و پەیمان شکێنی ئەویان بیری خەڵکان خستەوە. حارس جل وبەرگی ڕەشی پۆشیبوو، بانگەشەی گەڕانەوە بۆ نووسرای خواوەند و شێوازی پێغەمبەری دەکرد. لەفاریابەوە بەرەو بەڵخ بەرێکەوت کەنەسر کوڕی سەیار فەرمانڕەوایەی ئەو شارە و توجەیبی کوڕی زوبەیعەی موڕی هاوکاری دەکرد. ئەم دووانە هاوڕێ لەگەڵ دەهەزار پیاوی شەڕکەر رووبەڕوی حارس بوونەوە کەسەرکردایەتی چوار هەزار پیاوی شەڕکەری دەکرد. خەڵکانی بەڵخ شکستیان خوارد و حارس شوێنیان کەوت و ڕۆشتە ناو شارەکە. نەسر لەشارەکە ڕۆشتەدەر و حارس فەرمانیدا شوێنی نەکەون. پیاوێك لەبنەماڵەی عەبدوالله کوڕی خازمی کردە فەرمانداری ئەو شارە و بەرەو جوزجان بەرێکەوت و دەستی بەسەردا گرت. هەروەها دەستی بەسەر شارەکانی تاڵەقان و مەروروددا گرت.

کاتێك ڕۆشتە جوزجان، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد تا هێرش بکەنە سەر کام شارە. وتیان: مەرو پێگە و پایتەختی خوراسانە و سوارکار و شەڕکەرانی فراوانی لێکۆبۆتەوە. تەنانەت ئەگەر کۆیلەکانی خۆیان بۆ شەڕی تۆ ڕەوانە بکەن، دادی خۆیان لەتۆ وەردەگرن. بمێنەرەوە و ئەگەر هێرشیان کردە سەرتۆ، شەڕیان لەگەڵ بکە و ئەگەر مانەوە، ڕێگە مەدە پێداویستییەکانی ژیانیان پێبگات. وتی: ئەمە پەسەند ناکەم. بەرەو مەرو بەرێکەوت. فرەزانەکانی مەرو ووتیان: ئەگەر بگاتە نەیشابوور، ئێمەیش لەناو دەبات و ئەگەر هێرش بکاتە سەرئێمە، خۆی لەناو دەچێت.

عاسمیان ئاگادار کردەوە کەخەڵکانی مەرو نامەیان بۆ حارس نووسیوە. وتی: ئەی خەڵکانی مەرو، ئێوە نامەتان بۆ حارس نووسیوە بەلاَم ئەگەر مەبەستی هێرش کردنە سەر شارەکەی ئێوە بکات، ناچار دەبن لەشارەکە بڕۆنەدەر. من بەرەو نەیشابوور بەرێدەکەوم و نامە بۆ سەروەری باوەڕداران دەنێرم تا بەسوپایەکی دەهەزار کەسی لەخەڵکانی شام، هاوکاریم بکات. موجەشەر کوڕی موزاحیم پێی وت: ئەگەر لەگەڵ تۆ لەسەر بنەمای ((جیابوونەوە)) و ((ئازادی)) پەیمان ببەستن کە لەشەڕدا هاوکاری و

چاکەخوازی تۆبن، خۆت لەوان دوور مەخەرەوە.

دەڵێن: حارس هاورێ لەگەڵ شەست هەزار پیاوی شەڕکەر مەبەستی هێرش کردنە سەر مەروی کرد. سوارەکانی ئەزد و تەمیم هاورێیەتیان دەکرد و لەناو ئەوان: محەممەد کوڕی موسەنا، حەماد کوڕی عامری حیمانی، داوودی ئەعسەر، بیشر کوڕی ئونەیفی ریاحی و لەسنوردارەکان، سنورداری جوزجان و فاریاب و پاشای تالەقان و فەرمانداری مەرورود و هاوتاکانیان. عاسم لەگەڵ خەڵکانی مەرو و کەسانی دیکە بەرێکەوت. لەشکرگەی دروست و پردەکانی خاپوور کرد. هاوەڵانی حارس هاتن و سەر لەنوێ، پردەکانیان نۆژەن کردەوە. محەممەد کوڕی موسەنا فەراهیدی لەگەڵ دوو هەزار شەڕکەری ئەزدی پەیوەستی عاسم بوو و رووی کردە خەڵکانی ئەزد و حەماد کوڕی عامری حیمانی ڕۆشتە لای حارس و رووی کردە منداڵەکانی تەمیم. حارس وعاسم رووبەروی یەك بوونەوە. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی حارس، وابز کوڕی عەبدوالله کوڕی زەرارەی تەغلەبی بوو. شەڕێکی قورسیان کرد و سوپاکەی حارس شکستیان خوارد و هەڵاتن. زۆربەی هەڵاتووان لەروبارەکانی مەرو و مەهین روود خنکان. فەرمانداری شارەکان بۆ شارەکانی خۆیان گەڕانەوە و خازم کوڕی عەبدوالله لەناودا خنکا ((کەهاورێیەتی حارسی دەکرد)). سوپاکەی حارس بەسەختی کوشتار کران. حارس دۆڵی مەروی بڕی و لای خانەقای مەسیحیەکانی ئەیوان، خێوەتی هەڵدا و عاسم دەستی لێهەڵگرت. نزیکەی سێ هەزار کەس لەدەروی عاسم کۆبوونەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا هوشام، عوبەیدالله کوڕی حەبحابی موسڵی لەفەرمانداری میسر لابرد و وەك کارگوزاری خۆی لەئەفریقیە دەستنیشانی کرد. عوبەیدالله بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت. هەروەها لەم ساڵەدا حەبحاب سوپایەکی بۆ سیسیل ڕەوانە کرد. کەشتیەکانی رۆم روبەروویان بوونەوە و شەڕێکی گەورەیان دەستپێکرد. رۆمییەکان شکستیان خوارد. ئەوان دەستەیەك لەموسوڵمانانیان ئەسیر کردبوو. کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی زیاد لەناو ئەواندا دەبینرا و تا ساڵی سەد و بیست و یەك/ ٧٣٩ زایینی ئەسیری رۆمەکان بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا حەبحاب سوپایەکی بۆ سوس و پانتاییەکانی سودان ڕەوانە کرد.

سوپاکەی تالآنیان دەسکەوت و چەندین سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی حەبحاب کوڕی عەتییە کوڕی حەجاجی قەیسی وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس دەستنیشان کرا و لەشەوالّی ئەم ساڵە، نۆڤەمبەری ٧٣٤ زایینی بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت. عەبدولمەلیك کوڕی قەتەن لەسەر کار لابرا. ئەو هەموو ساڵێك لەرێگەی خوادا شەڕی دەکرد. ئەو بوو دەستی بەسەر گالیسیا و چەندین ناوچەی دیکەدا گرت. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو عەبدوالله کوڕی حەبحاب لەساڵی ١١٧/ ٧٣٥ زایینی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقیە دەستنیشان کرا. گێڕانەوەکان سەبارەت بەو لەو ساڵەدا باس دەکەین چوونکە راستتر بەرچاو دەکەوێت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەڤدەی کۆچی (( ٧٣٥ زایینی ))

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام لەقۆڵی چەپەوە شەڕی هاوینەی کرد و سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك لەقۆڵی راستەوە، لەجەزیرەوە بەڕێکەوت و سوپاکەی خۆی بۆ سووچ و کەنارەکانی رۆم ڕەوانە کرد. لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی مەروان فەرمانداری ئەرمەنستان دوو سوپای بۆ شەڕ ڕەوانە کرد کەیەکێك لەم دوو سوپایە، دەستی بەسەر سێ قەلا لەناوچەی لان دا گرت و ئەوی دیکەیان هێرشی کردە سەر تومان پاشا و خەڵکەکەی لەسەر بنەمای ئاشتی تەسلیم بوون.

## لەسەر کارلابردنی عاسم لەفەرمانداری خوراسان و هاتنە سەرکاری ئەسەد کوڕی عەبدوالله

لەم ساڵەدا، هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، عاسم کوڕی عەبدواللەی لەفەرمانڕەوایەتی کردنی خوراسان دوورخستەوە و فەرمانداری ئەو شارەی بەخالید کوڕی عەبدوالله قەسری سپارد. ئەو براکەی خۆی ئەسەد کوڕی عەبدواللەی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو کەعاسم نامەی بۆ هوشام نووسی: دوای سلاو، ((پێشەنگ درۆ لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی ناکات)) کاروبارەکانی خوراسان سەقامگیر نابێت مەگەر ئەوەی فەرمانڕەوایەتی کردنی ئەو شارە بەفەرمانڕەوای عێراق بسپێرن تا هۆکارەکان وپێداویستیە پێویستەکان لەڕێگەیەکی نزیکەوە بێنن چوونکە سەروەری باوەڕداران لەم شارەوە دوورە و هاوکارییەکانی درەنگ دەگات. هوشام خوراسانی پەیوەستی فەرمانڕەوایەتی خالید کوڕی عەبدواللەی قەسری کرد و فەرمانی پێدا: براکەت ڕەوانە بکە تا وێرانی و گەندەڵییەکانی ئەو شارە سامان بدات. عاسمیان ئاگادار کردەوە کەئەسەد لەزووترین کاتدا دەگات. ئەو محەممەد کوڕی مالکی هەمەدانی وەك فەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی دەستنیشان کردبوو. عاسم لەگەڵ حارس کوڕی سورەیح ئاشتی کرد و پەیمانێکیان لەناو خۆیاندا نوسی. بەپێی ئەم پەیمانە، حارس دەتوانێت بۆ هەرکام

لەشارەکانی خوراسان، بڕوات و هەر دووکیان نامە بۆ هوشام بنووسن و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ نووسرای خواوەند و شێوازی پێغەمبەری پێبکەن و ئەگەر رازی نەبوو، بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەو، ببنە هاوپەیمان. دەستەیەك لەگەورەکان، ژێر نامەکەیان مۆرکرد بەڵام یەحیا کوڕی حوزەین کوڕی مونزەر مۆری نەکرد، وتی: ئەمە سەرپێچی کردن لەفەرمانی سەروەری باوەڕدارانە. نامەکە، بەمشێوەیە بەها و گرنگی خۆی لەدەستدا.

عاسم لەگوندێك لەبەرزاییەکانی مەرو بوو. حارس کوڕی سورەیج هێرشی کردەسەر. رووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕێکی قورسیان کرد. حارس شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی ئەسیر کران کەعەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ مازنی لەخەڵکانی مەرو، یەکێك بوو لەوان. عاسم ئەسیرەکانی کوشت. ئەسپەکەی حارسیان بەتیر بریندار کردبوو. حارس تیری لەجەستەی ئەو بێزمانە، دەرهێنا و بەردەوام نەقیزەی تێدەوشاند تا ئازارەکەی لەبیر بباتەوە. پیاوێکی خەڵکی شام هێرشی کردەسەر و کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، حارس جڵەوی ئەسپەکەی سووڕاند و هێرشی کردە سەر پیاوەکە. پیاوی شامی پێی وت: بۆ رێزگرتن لەئیسلام سوێندت دەدەم خوێنم نەڕێژیت! حارس پێی وت: لەئەسپەکەت دابەزە. لەئەسپەکەی دابەزی و حارس سواری بوو. پیاوێك لەقەیس لەمبارەوە وتی:

| | |
|---|---|
| تولت قريش لذة القيس و اتقت | بنا كل فج من خراسان اغبرا |
| فليت قريشا اصبحوا ذات ليلة | يعومون فى لج من البحر اخضرا |

یانی: قوڕەیشیەکان روویان کردە رابواردن و کامەرانی و ئێمەیان لەهەر رێگەیەکی سەخت و دوژار و پڕ تەپ و تۆز بۆ بەرگری کردن لەخۆیان ناچار کرد. خۆزگە قوڕەیشیەکان یەك شەو، دەکەوتنە ناو گێژاوێکی خرۆشان لەدەریایەکی سەوز لەناو تۆفان.

خەڵکانی شام یەحیا کوڕی حوزەینیان بەکەسێکی گەورە لەقەڵەمدا لەبەر ئەوەی بۆ بێ بەها کردنی نامەکە، هەوڵیدا بوو. لەنامەیەکدا باسی رووداوەکان و شکست خواردنی حارسیان نووسی و بەمحەممەد کوڕی موسلیمی عەنبەری ڕەوانەیان کرد. ئەو لەرەی بای بەیەهەق چاوی بەئەسەد کوڕی عەبدوڵڵە کەوت. نامەی بۆ خالیدی برای نووسی و بەدرۆ واینیشاندا کەخۆی حارسی شکستداوە. لەکارەکەی یەحیایش ئاگاداری کردەوە. خالید دەهەزار دیناری پاداشت بۆ یەحیا ڕەوانە کرد و سەد جل و بەرگی گرانبایی پێبەخشی.

فەرمانڕەوایەتی عاسم کەمتر لەیەك ساڵی خایاند. ئەسەد ئەوی خستە زیندان و لێپرسینەوەی لەگەڵ کرد و خوازیاری سەد هەزار درەم بوو. وتی: تۆ بەختەوەر نەبوویت. ئەسەد، عومارە کوڕی حورەیم و کارگوزارەکانی جونەیدی ئازاد کرد.

کاتێك ئەسەد هات، تەنیا مەرو و نەیشابوور لەژێر دەستی عاسمدا نەبوو. حارس لەمەروروود و خالید کوڕی عەبدوڵڵای هیجری لەئامول و هاوپەیمانی حارس بوو. ئەسەد لەوە ترسا کەئەگەر مەبەستی هێرش کردن سەر حارس لەمەروروود بکات، هیجری لەئامولەوە پێشڕەوی دەستپێبکات و ئەگەر هێرش بکاتە سەر هیجری، حارس لەمەروروودەوە، هێرشی بکاتەسەر. سەرئەنجام بڕیاریدا عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم لەگەڵ خەڵکانی کوفە و شام بۆ هێرش کردنە سەر حارس ڕەوانەی مەروروود بکات و خۆی هێرش بکاتە سەر هیجری لەئامول و خەڵکەکەی لەگەڵ خۆی ببات. کاتێك گەیشتە ئامول، سوپای ئامول بەسەرکردایەتی زیادی قورەشی موالی حەیانی نەبتی وەك سەرکردەی سوارەکان، ڕووبەڕوی بوویەوە بەڵام شکستی خوارد و بۆ ناو شارەکە پاشەکشێیان کرد. ئەسەد گەمارۆی خستە سەر ئەوان و کەشکەنجیرەکانی بۆ دانان. سەرکردەی ئەوان هیجری یەکێك لەهاوەڵانی حارس بوو. خەڵك خوازیاری ئەمان بەخشین بوون. ئەسەد کەسی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد و وتی: چیتان دەوێت؟ وتیان: نووسرای خواوەند و شێوەی پێغەمبەر(د.خ) و ئەوەی خەڵکی ئامول لەتاوانی گوناحەکەی ئێمە، سزا نەدەن. ئەسەد ڕازی بوو و یەحیا کوڕی نوعەیم کوڕی هوبەیرەی شەیبانی وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەسنیشان و بەرەو بەڵخ بەڕێکەوت. ئاگاداریان کردەوە کەخەڵکی بەڵخ لەگەڵ سلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی خازم بەیعەتیان کردووە. بەڕێکەوت تا گەیشتە ئەو شارە. سوار کەشتی ولەوێوە بەرەو تێرمێز بەڕێکەوت و بینی حارس گەمارۆی خستۆتەسەر و سەنانی ئەعرابی لەوێیە. ئەسەد لەمبەری ڕووبارەکە دابەزی بەڵام نەیتوانی بپەڕێتەوە و نەیتوانی هاوکاری ئەوان بکات. خەڵکانی تێرمێز هاتنەدەر و لەگەڵ حارس شەڕیان کرد. حارس پاشەکشێی کرد و گەڕایەوە. ئەو شەڕکەرانی لەسەر ڕێگەکەی ئەوان دانابوو. خەڵکانی تێرمێز شوێنی کەوتن. نەسر کوڕی سەیار لەگەڵ ئەسەد سەیری ئەم دیمەنەیان دەکرد. ڕووی گرژ کرد و زانی حارس بۆسەی بۆ ئەوان ناوەتەوە. ئەسەد گومانی کرد بۆیە ڕووی گرژ کردەوە چوونکە بەزەیی

بەحارسدا هاتۆتەوە لەکاتی پاشەکشێ کردن. مەبەستی ئەوەی کرد سەرکۆنەی ئەسر بکات کە لەناکاو ئەوانەی بۆسەیان دانابوو، هێرشیان کردە سەر خەڵکان و شکستیان پێهێنان.

ئەسەد بەرەو بووخارا بەرێکەوت و خەڵکی تێرمێز هێرشیان کردەسەر حارس و شکستیان پێهێنا و دەستەیەك لەشارەزایان و فرەزانانیان کوشت کەعێکرەمە و باوکی فاتیمە لەناو ئەواندا بوون. ئەسەد بەردو سەمەرقەند بەرێکەوت و لەم شارە تێپەڕی و بەرەو زەم ڕۆشت. کاتێك گەیشتە زەم، کەسی بۆ لای هەیسەمی شەیبانی (لەهاوەڵانی حارس کە لەناو یەکێك لەقەڵاکاندا بوو)) ڕەوانە کرد و پێی وت: ئێوە فەرمانڕەواکانتان بۆ کارە نەشیاو و قێزەونەکان سەرکۆنە دەکەن بەڵام دیل گرتن و دەست درێژی کردن بۆ داوێنی پاکی ژنان و زاڵبوونی بتپەرستان، نەگەشتە ئەو رادەی کە لەسەمەرقەند روویدا. من خوازیاری سەمەرقەندم و پەیمان و ئەمانی خوایی بەتۆ دەبەخشم و بەڵێن دەدەم هیچ زیانێکت بەرنەکەوێت. تۆ و هاوەڵانت ئەمانتان پێدەبەخشرێت. ئەگەر بەداواکاریەکەم رازی نەبیت، پەیمانی خوایی لەئەستۆی مندا بێت کەتەنانەت ئەگەر یەك تیر بهاوێژیت، چیتر بەهیش شێوەیەك ئەمانت پێنەبەخشم و ئەگەر هەزار ئەمانت پێببەخشم، هیچ کات پێبەندی بەڵێنەکەم نەبم. ئەو لەسەر بەخشینی ئەمانی ئەسەد خۆی تەسلیم کرد و هاوڕێ لەگەڵ ئەو بەرەو سەمەرقەند بەرێکەوت و لەوەرەغسەرا تێپەڕی کەئاوی سەرمەقەند لەوێوە ڕەوانە. دۆڵەکەی بەست و زیانی ئەوی لەشارەکە دوورکردەوە و دواتر بۆ بەڵخ گەڕایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: داستانی ئەسەد و هاوەڵانی حارس لەساڵی ١١٨/ ٧٣٦ زایینیدا روویداوە.

## بەسەرهاتی بانگەشەکەران بۆ بەنی عەباس

دەڵێن: لەم ساڵەدا، ئەسەد کوڕی عەبدوالله دەستەیەك دەستەیەك لەبانگەشەکەرانی عەباسی گرت و چەند کەسێك لەوانی کوشت و گووێ و لوت و پێ و دەستی دەستەیەکی دیکەی بڕییەوە و دەستەیەکی دیکەی خستە زیندانەوە. لەناو ئەسیرەکان، ئەم کەسانە دەبینران: سلێمان کوڕی کەسیر، مالیك کوڕی هەیسەم، موسا کوڕی کەعب، لاهیز کوڕی

قورەیز، خالید کوڕی ئیبراهیم و تەڵحە کوڕی زورەیق. ئەوانیان هێنا و پێی وتن: ئەی خراپەکارانن مەگەر خواوەند نەیفەرموە: خواوەند لەرابردوو خۆش بوو و هەرکەس بۆ سەر خراپەکاری بگەڕێتەوە، خواوەند تۆڵەی لێدەستێنێت ((مائدە ٥/ ٩٥)) سلێمان وتی: سوێندە بەخوا ئێمە بەو شێوەن کەشاعیر دەڵێت:

لو بغیر الماء حلقی شرق          کنت کالغصان بالماء اعتصاری

یانی: ئەگەر جگە لەئاو، شتێك لەقوڕگم گیر بکات، گیرانی قورگم، بەئاو چارەسەر دەکرد.

سوێند بەخوا، بێ گومان ناحەز و نەیارەکان لەسەر دەستی تۆ لەناوچوون! ئێمە خەڵکانێك لەخەڵکەکەی تۆین. خەڵکانی موزەر لەبەر ئەوە بەپێچەوانەوە داستانەکەیان بۆ تۆ گێڕاوتەوە چوونکە ئێمە سەختگیرترینی خەڵکان لەسەر قوتەیبە کوڕی موسلیم بوون. ئەوان دەخوازن تۆڵەیان خۆیان بستێننەوە ((نەك چاکەخوازی بۆ تۆ) ئەوانی ڕەوانەی زیندان و بە عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیمی وت: بۆچونی تۆچییە؟ وتی: بەباشی دەزانم، ئەوان بەبنەماڵەکانیان ببەخشیت و زیندانییەکانی ئەوان ئازاد بکەیت تا سپاست بکەن و خۆیان بەقەرزاری تۆ بزانن. وتی: ئەو کارە ناکەم. دواتر خەڵکانی یەمانی ئازاد کرد چوونکە خۆی لەوان بوو. هەروەها ئەوانی لەهۆزی رەبیعە بوون، ئازاد کران لەبەر ئەویە هاوپەیمانی خەڵکانی یەمەن بوون. مەبەستی کوشتنی موزەریەکانی کرد. موسا کوڕی کەعبی بانگ کرد و جڵەوی کەری لەدەمیدا و رایکێشا بەشێوەیەك دانەکانی شکان و لووت و روخساری بریندار و خوێناوی بوو و پێستەکەی داماڵڕا. لاهیز کوڕی قورەیزی بانگ کرد کەوتی: ئەمە ئایینی راستی و دروستی نییە ئەو کارە لەگەڵ ئێمە و خەڵکانی رەبیعە و یەمەن، ئازاد دەکەیت. سێسەد قامچی لێدا. حەسەن کوڕی زەیدی ئەسەدی لەبەرەژوەندی ئەو شایەتیدا کەخۆی و هاوەڵانی بێ تاوانن. ئەوانی ئازاد و دەستی لێهەڵگرتن.

## فەرمانداری عوبەیدالله کوڕی حه بحاب لەئاندۆلۆس و ئەفریقییە

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، عوبەیدالله کوڕی حەبحابی وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس و ئەفریقییە دەستینشان کرد و فەرمانی پێدا بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوێت.

عوبەیداللە فەرمانداری میسر بوو. کوڕەکەی وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشان و بەرەو ئەفریقییە بەڕێکەوت و عوقەبە کوڕی حەجاجی لەفەرمانڕەوای ئاندۆلۆس دوورخستەوە و کوڕەکەی خۆی، ئیسماعیل کوڕی عوبەیداللە کوڕی حەبحابی کردە فەرمانڕەوای تەنجە((تانژە)). حەبیب کوڕی ئەبی عوبەیدە کوڕی عوقەبە کوڕی نافعی بۆ شەڕ لەرۆژئاوا رەوانە و خۆی ڕۆشتە ناو ئەفریقییە. تا سەرزەمینی سودان و سوس پێشڕەوی کرد و رووبەرووی هەرکەس بوویەوە، سەرکەوتنی بەدەستهێنا. تالآنی و ئەسیری زۆری کۆکردەوە و خەڵکانی مەغریب ترسی ئەویان کەوتە دڵەوە. لەناو ئەسیرەکانی بەربەر، دووکچیان دۆزییەوە کەهەر کامیان تەنیا یەك مەمکی هەبوو. تەندروست و سەرکەوتوو گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

لەساڵی ١١٧/ ٧٣٥ زایینی، سوپایەکی لەرێگەی دەریاوە بۆ دورگەی ئەردانییە رەوانە کرد. شەڕکەرانی دەستیان بەسەر چەندین ناوچەدا گرت و تالآنیان کۆکردەوە و گەڕانەوە. لەساڵی ١٢٢/ ٧٤٠ زایینی سوپاکەی بۆ دوورگەی سیسل ڕەوانە کرد بەسەرکردایەتی کوڕەکەی عەبدولرەحمان کوڕی حەبیب. کاتێك لەو سەرزەمینە دابەزی، عەبدولرەحمانی لەگەڵ سوپایەك بۆ شەڕ ڕەوانە کرد. لەگەڵ هەر کەسێك شەڕیان کرد، شکستیان پێهێنان. عەبدولرەحمان لەهەموو شەڕەکانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا. سەرکەوتنەکانی بەردایەك گەورە بوون هاوشێوەیان نەبینراوە. سەرئەنجام لەشاری سارگوسا ((سەرقوسە)) دابەزی کەگەورەترین دورگەی سیسیلە. دانیشتوانی دوورگە شەڕیان لەگەڵ کرد و شکستیان خوارد. عەبدولرەحمان گەمارۆی خستە سەریان و لەسەر بنەمای وەرگرتنی باج پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و تەندروست بۆ لای باوکی گەڕایەوە.

## شۆڕشی مەیسەرەی خارجی ((خەواریجی))

حەبیب مەبەستی ئەوەی کرد لەسیسیل بمێنێتەوە تا دەست بەسەر هەموو ناوچەکانی ئەو سەرزەمینەدا بگرێت. بەلآم نامەی حەبحابی پێگەیشت کەفەرمانی گەڕانەوە بۆ ئەفریقییەی تیا نووسرا بوو.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کوڕەکەی ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله کوڕی حەبحابی وەك

فەرمانداری تانزە دەستنیشان کرد و عومەر کوڕی عەبدوڵڵای موورادی کردە هاوڕێی ئەو. ئەو، کردارێکی خراپی گرتەبەر و سنورەکانی بەزاند و هەوڵیدا لەبەربەرە موسوڵمانەکان یەك لەسەر پێنج وەربگرێت چوونکە باوەڕی وابوو ئەوان سەرچاوەی داهاتی موسوڵمانان و سەرچاوەی رۆژی وبەختەوەری ئەوانن. ئەمە کارێك بوو پێشتر هیچ کام لەفەرمانڕەواکان، بیریان لێنەکردبوویەوە. کاتێك بەربەرەکان لەهاتنی حەبیب کوڕی عوبەیدە بۆ سیسیل ئاگادار بوونەوە و زانیان سوپایەکی گەورە هاوڕێیەتی دەکات، چاوی تەماحیان بڕییەوە ئەو ناوچەیە و پەیمانەکەی خۆیان لەگەڵ کوڕی حەبحابدا شکاند و پێشنیاری شەڕکردنیان بەناباوەڕان و موسوڵمانانداا. گرفتاری و گێژاوێکی گەورە دروست بوو. ئەو بەربەرانەی لەتانزە بوون، سەرتا مەیسەرەی ئاوکێشیان وەك سەرکردەی خۆیان دەستنیشان کرد و دوای ئەو مەدغووی. (( ئەگەری هەیە مەدغوی ئازناوی مەیسرە بێت لەبەر رستەی خوارەوە)) ئەو پیاوێك لەخەواریج و صوفری (دەستەیەك لەخەواریج) و کارەکەی ئاوکێشان بوو. عومەر کوڕی عەبدوالله شەڕی لەگەڵ کردن. بەربەرەکان ئەویان کوشت و دەستیان بەسەر تانزەدا گرت و وەك خەلیفە بەیعەتیان بەمەیسرەدا. ئەویان وەك سەروەری باوەڕداران ناو برد. سوپاکەی لەبەربەریەکان فراوان و دەسەلآت و هێزی لەپانتاییەکانی تانژە زیادی کرد.

لەم کاتەدا لەئەفریقییە، دارودەستەیەك دەرکەوتن کەوتاری خەواریجیان ئاشکرا کرد. کوڕی حەبحاب کەسی بۆ لای حەبیب رەوانە کرد کە لەسیسیل بوو. ئەوی بانگ کرد تا بۆ شەڕی مەیسەرەی ئاوکێش ڕەوانە ببێت چوونکە دەسەلآتی فراوان ببوو. حەبیب بۆ ئەفریقییە گەڕایەوە.

کوڕی حەبحاب، خالید کوڕی حەبیبی بەسوپایەك بۆ شەڕی مەیسەرە رەوانە کرد. کاتێك حەبیب کوڕی باوکی عوبەیدە گەیشت، ئەوی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد. خالید و مەیسەرە لەپانتاییەکانی تانژە روبەرووی یەك بوونەوە و شەڕێکی قورسیان خستەگەڕ کەهاوشێوەکەی نەبینراوە و نەبیستراوە. مەیسەرە بۆ تانژە گەڕایەوە. بەربەریەکان ئەم کارەی ئەویان بەناپەسەند زانی. ئەویان وەك خەلیفەی خۆیان هەڵبژاردبوو. ئەویان کوشت و خەلافەتیان بەخالید کوڕی حومەیدی زەناتی سپارد. خالید کوڕی حومەید و بەربەرەکان لەگەڵ خالید کوڕی حەبیب و سوپای شام، شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد.

عەرەبەکان خۆڕاگریان کرد بەڵام کەوتنە بۆسەیەکی بەربەرەکانەوە و شکستیان خوارد. بۆ خالید گران و دژوار بوو لەسەر دەستی بەربەرەکان شکستی خواردبێت لەبەر ئەمە خۆڕاگریان کردە پیشە تا ئەوەی هەموویان کوژران.

لەم شەڕەدا، پاسەوانان و پاڵەوانەکانی عەرەب کوشتار کران. خەڵك شەڕەکەیان بەشەڕی گەورەکان ناوبرد و شارەکان ئاژاوەیان تیا دروست بوو. ئاندۆلۆسیەکان لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە و هێرشیان کردە سەر فەرمانڕەواکەی خۆیان، عوقبە کوڕی حەجاج و لەسەر کار لایانبرد و عەبدولمەلیك کوڕی قەتەنیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان دەستنیشان کرد. کارەکان بۆ کوڕی حەبحاب ئاڵۆز بوو. ئەم هەواڵانە بە عەبدولمەلیك کوڕی مەروان گەیشت و وتی: بێ گومان تۆڵەی عەرەبەکان دەستێنمەوە و سوپایەك ڕەوانە دەکەم کەسەرەتاکەی لەوێ بێت و کۆتاییەکەی لای خۆم. نامەی بۆ کوڕی حەبحاب نووسی و ئەوی گەڕاندەوە. هوشام لەجیاتی ئەو کولسوم کوڕی عەییازی قوشەیری هاوڕێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد. نامەی بۆ شارەکانی سەر ڕێگەی سوپاکە نووسی و فەرمانی بەشەرکەرندا پەیوەستی سوپاکەی ببن. سوپاکە گەیشتە ئەفریقییە. فەرماندەی پێشەنگەکان، بەلج کوڕی بشر بوو. لەقیروان دابەزی و لەسەر بنەمای خۆپەسەندی و ستەمکاری روبەرووی خەڵکەکەی بوویەوە. هەوڵیدا سوپاکەی لەناو ماڵەکانی ئەوان جێگە بکاتەوە. خەڵکی قیروان نامەیان بۆ حەبیب کوڕی باوکی عوبەیدە ((کە لەتەلمسان شەڕی لەگەڵ بەربەرەکان دەکرد)) نووسی و سکاڵایان لەبەلج و کولسوم کرد. حەبیب نامەی بۆ کولسوم نووسی: ئەگەر بەلج فلانە و فیسارە کاری ئەنجامداوە، لەو شارە کۆچ بکەن وەگەرنە جڵەوی ئەسپەکانم بۆ لای ئێوە دەسووڕێنم.

کولسوم داوای بەخشینی کرد و بۆ لای حەبیب بەرێکەوت. فەرماندەی پێشەنگەکانی بەلج کوڕی بشر بوو. ئەو جوێنی بەحەبیبدا و بەکەسێکی سووك، لەقەڵەمیدا. مشتومڕ لەنێوان ئەوان بەرز بوویەوە بەڵام دواتر ئاشتیان کرد و بۆ شەڕ لەگەڵ بەربەرەکان هاوپەیمان بوون. حەبیب بەوانی وت: پیادەکان لەبەرابەر پیادەکانی ئەوان جێگیر بکەن و سوارەکان لەبەرابەر سوارەکان. بەڵام رازی نەبوون. کولسوم لەگەڵ سوارەکانی خۆی بەرێکەوت و پیادەکانی بەربەر هێرشیان کردەسەر و شکستیان پێهێنا. ئەو تێکشکاو بۆ لای حەبیب گەڕایەوە. خەڵك ئەم کارەیان بەلاوازی وەسف کرد. شەڕ دەستی پێکرد.

سوارەکانی بەربەرِ بلاوەیان لێکرد بەلام پیادەکانیان خۆراگریان کرد. ژمارەی بەربەرەکان فراوانتر بوو. کولسوم کوڕی عەییاز و حەبیب کوڕی باوکی عوبەیدە و گەورەکانی عەرەب لەم شەڕەدا کوژران. عەرەبەکان شکستیان خوارد و بلاوەیان لێکرد. دەستەیەکیان بۆ قیروان گەڕانەوە.

## شۆڕشی عوکاشی خاریجی

کاتێك عەرەبەکان بەدوای ئەم شەڕە، سست و لاواز بوون. پیاوێك بەناوی عوکاشە کوڕی ئەییووب فەزاری لەشاری گابس دەرکەوت. ئەو سەرکردەی خەواریجی سوفری ئایین بوو. سوپایەك لەقیروانەوە بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت. شەڕێکی قورسیان خستەگەڕ و سوپاکەی قیروان شکستی خوارد. سوپایەکی دیکە بۆ شەڕی ئەوان بەرێکەوت. عوکاشە دوای شەڕێکی قورس شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەشوێنکەوتەکانی کوشتار کران. عوکاشە پەنای بۆ سەرزەمینی رەمل برد.

کاتێك هەواڵی کوژرانی کولسوم بەهوشام کوڕی عەبدولمەلیك گەیشت. حەنزەلە کوڕی سەفوانی کەلبی، وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە دەستنیشان کرد کە لەمانگی رەبیعی الثانی، ١٢٤ فەوریەی ٧٤٢ زایینی گەیشتە ئەو دیارە. ئەوەندە لەقیروان نەمایەوە کەعوکاشە هاوڕێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەخەڵکانی بەربەرِ هێرشی کردەسەر. لەکاتی شکستەکەی پێشووی، دووبارە ئەوانی کۆکردبوویەوە تا تۆڵەی خۆیان بستێننەوە. عەبدولواحید کوڕی یەزیدی هەواری مودغەمی کەپیاوێکی خاریجی و سوفری ئایین بوو، هاوکاری کرد و سوپایەکی گەورەی لەدەوری ئەو کۆکردەوە. ئەم دووانە لەیەك جیابوونەوە تا لەقیروان لەدوو قۆڵەوە پەیوەستی یەك ببن. کاتێك عوکاشە نزیك کەوتەوە، حەنزەلە هێرشی کردەسەر. لەنێوان ئەوان شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و عوکاشە شکستی خوارد. ژمارەیەکی زۆر لەبەربەرییەکان کوشتار کران کەهیچ کەس نەیتوانی بەتەواوی ژمارەی کوژراوەکان بزانێت. حەنزەلە لەترسی عەبدولواحید بۆ قیروان گەڕایەوە و سوپایەکی گەورەی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد کەژمارەکەی، چل هەزار پیاوی شەڕکەر بوو. کاتێك لەیەك نزیك بوونەوە، جۆیان دەستنەکەوت دەرخواردی چوارپێکانی خۆیانی بدەن و لەبەر ئەمە گەنمیان دەرخوارددان. بەیانی ئەو رۆژە روبەرووی عەبدولواحید بوونەوە و

شەڕیان دەستپێکرد. بەڵام شکستیان خوارد و بۆ قیروان گەڕانەوە. چوارپێکانیان لەبەر خواردنی گەنم لەناوچوون.

کاتێك گەیشتنە قیروان، بینیان بیست هەزار ئەسپیان لەدەستداوە. عەبدولواحید بەزێکەوت و لەسی میلی قیروان لەشوێنێك بەناوی ((بتەکان)) دابەزی. سێسەد هەزار پیاوی شەڕکەر، هاورێیەتیان دەکرد. حەنزەلە هەموو دانیشتوانی قیروانی کۆکردەوە و لەناو ئەوان سامان و کەرەستەکانی شەڕی دابەش کرد و بەمشێوەیە ژمارەی سوپاکەی فراوان کرد. کاتێك خەواریج و عەبدولواحید نزیك کەوتنەوە، حەنزەلە لەقیروان رووبەروویان بوویەوە. هەردوو سوپا بۆ شەڕ ریزیان بەست و زاناکانی دین، لەناو شەڕکەرانی قیروان دەستیان بەوتارخوێندنەوە کرد و بۆ شەڕ، هانیاندان. شەڕ لەگەڵ خەواریجیان بەکارێکی گەورە و پیرۆز لەقەڵەمدا و بیریان خستنەوە بەچ شێوەیەك ژن و منالەکان ئەسیر و دەیانکەنە کۆیلە و پیاوەکان کوشتار دەکەن. خەڵك، کالانی شمشێرەکانی خۆیانیان شکاند و ژنەکان هاتن وبۆ شەرێکی بوێرانە هانیاندان. خەڵك کەوتنە جموجۆڵ و هێرشێکی سەراپاگیریان دەستپێکرد. هەر دوو سوپا خۆڕاگری کرد و شەڕ سات لەدوای سات بەرەو دژواری دەڕۆشت. خواوەند، خەواریج و بەربەرەکانی شکستدا و هاوکاری عەرەبەکانی کرد. کوژراوەکان لەناو سوپاکەی خەواریج فراوان بوون. سوپاکەی قیروان شوێنیان کەوتن و بەکوشتار کردنیانەوە سەرقاڵ بوون و نەیانزانی عەبدولواحید کوژراوە تا ئەوەی سەری ئەویان بردە لای حەنزەلە. خەڵك سەری کوڕنوشیان خستە سەرخاك و سپاسی خوایان کرد.

دەڵێن: لەپانتاییەکانی مەغریب، زیاتر لەم ژمارە کوژراو نەبینراوە. حەنزەلە فەرمانیدا، کوژراوەکان بژمێرن بەڵام لەم کارەدا ناتەوان بوون. کوژراوەکانیان بەقامیش نیشانە دەکرد. سەد و هەشتا هەزار کوژراویان بژارد. عوکاشە لەگەڵ دەستەیەکی دیکە، لەشوێنێکی دی ئەسیر و بۆ لای حەنزەلە ڕەوانە کرا. حەنزەلە فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد و هەواڵی سەرکەوتنەکەی خۆی بۆ هوشام نووسی. لەیس کوڕی سەعد دەیوت: تا ئێستا، جگە <<<لەشەڕی بەدر، شەرێکی بەدژواری ئەم شەڕەم نەبینی و نەبیست.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی هوشام، لەقۆڵی چەپەوە بۆ شەڕی هاوینە بەڕێکەوت و سلێمان کوڕی هوشام لای جەزیرەوە شەڕی کرد. ئەو شەڕکەرانی خۆی لەسەرزەمینی ڕۆم بلاّو کردەوە.

لەم ساڵەدا خالید کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ خەڵکان ئایینی حەجی ئەنجامدا. فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف، محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیلی مەخزومی و فەرمانڕەوای ئەرمەنستان و ئازەربایەجان، مەروان کوڕی محەممەد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا کۆچی دواییان کرد: فاتیمە کچی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، سەکینە کچی حسین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، عەبدولرەحمان کوڕی هورموزی شەل لەئەسکەندەریە، کوڕی باوکی مولەیکە کەناوەکەی عەبدوالله کوڕی عوبەیدالله کوڕی باوکی مولەیکەیە، باوکی ڕەجای عوتاردی، باوکی شاکر مەسلەمە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، مەیمون کوڕی میهرانی فەقیە کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١١٨/ ٧٣٦ زایینی کۆچی کرد، نافیع موالی کوڕی عومەر کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٢٠/ ٧٣٨ زایینی، مرد. ئەبووبەکر محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٢٠/ ٧٣٨ زایینی یا ١٢٦/ ٧٤٤ زایینی یا ١٣٠/ ٧٤٨ زایینی مرد. عایشە کچی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس، سەعید کوڕی یەسار، قتادە کوڕی دیعامەی بەسری کەکوێر بوو و لەساڵی ٦٠/ ٦٨٠ چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەكانی ساڵی سەد و هەژدەی كۆچی (( ٧٣٦ زایینی ))

لەم ساڵەدا معاویە كوڕی هوشام كوڕی عەبدولمەلیك و براكەی سلێمان كوڕی هوشام، بەمەبەستی شەڕ كردن ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی ڕۆمیەكان.

## بانگەوازی بەنی عەباس ( و خیداشی خورەمی )

لەم ساڵەدا، بووكەیر كوڕی ماهان، عەمار كوڕی یەزیدی وەك ڕێبەری شوێنكەوتەكانی بەنی عەباس بۆ خوراسان ڕەوانە كرد. ئەو لەمەرو مایەوە و ناوی خۆی گۆڕی و بەخیداش خۆی ناساند و پێشنیاری شوێنكەوتنی محەممەد كوڕی عەلی بەخەڵكان دەكرد. خەڵك لەدەروی كۆبوونەوە و ملكەچی و گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا. بەڵام ئەو بانگەوازەكەی خۆی گۆڕی و ئایینی خورەمی ئاشكرا كرد و خەڵكی بۆ شوێنكەوتنی ئەو ئایینە هاندا. چێژ وەرگرتن لەژنانی یەكتری بۆ شوێنكەوتەكانی ڕەوا كرد. پێی وتن: نوێژ و ڕۆژوو لەئارادا نییە و پێویست ناكات حەج بكەن. ڕۆژو بریتییە لەوەی ناوی ڕێبەر نەهێننە سەرزمان. نوێژ یانی ئەوەی لەخواوەند بۆ سەركەوتنی ڕێبەرەكەیان بپاڕێنەوە و حەج ئەومیە لەدەوری ماڵەكەی ئەو كۆببنەوە. لێكدانەوەی بۆ ئەم ئایەی قورئان دەكرد كەخواوەند دەفەرمێت: لەسەر خواپەرستان و ئەو كەسانەی كرداری چاكە دەگرنەبەر، هیچ كەمتەرخەمییەك لەبژێوی ئەواندا نییە لەسەر ئەو بنەمای كەخۆپارێز بن و باوەڕ بەخوا و كارەچاكەكان ئەنجام بدەن. ((مائدە/٥/٩٣)). خیداش پیاوێكی خۆپارێز و لەكوفە ژیانی بەسەر دەبرد. دواتر باوەڕی بەئیسلام هێنا و بۆ خوراسان كۆچی كرد.

لەو كەسانەی بەوتەكانی رازی و شوێنیكەوتن، مالیك كوڕی هەیسەم و حەریش كوڕی سولەیمی ئەعجەمی و كەسانی دیكە بوون. بەوانی وت: محەممەد كوڕی عەلی بۆ ئەم كارانە فەرمانی پێداوە.

ئەم هەواڵە بەئەسەد كوڕی عەبدوالله گەیشت و ئەوی دەستگیر كرد. خیداش بەتوندی قسەی لەگەڵ ئەسەد كرد. ئەسەد، زمانی بڕی و چاوەكانی كوێر كرد. وتی: سپاس بۆ خوا كە لەبەرژەوەندی عومەر و ئەبووبەكر تۆڵەی لەتۆ سەندەوە! فەرمانی

کوشتنی بەیەحیا کوڕی نوعەیمی شەیبانیدا و لەئامول، لەداریاندا. هەروەها (جەزور) کۆیلەی موهاجیر کوڕی دارەی زەبییان بردە لای نەسەد کە لەسەر کەنارەکانی روبار کوشتیان.

## بەسەرهاتی حارس و هاوەڵانی

لەم ساڵەدا ئەسەد لەبەڵخ دابەزی و جودەیعی کرمانی بۆ ئەو قەڵایەی بنەماڵەی حارس و هاوەڵانی لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد، ڕەوانە کرد. ناوی قەڵاکە تەبووشکان و یەکێك بوو لەشارەکانی تەخارستانی سەروو. مناڵەکانی بەرزیانی تەغلەبی زاواکانی حارس لەو شارەدا نیشتەجێ بوون. کرمانی گەمارۆی خستە سەرئەوان و دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت. مناڵەکانی بەرزی کوشتار کرد و هەموو خەڵکەکەی لەعەرەبەکان و موالیەکان و ژن و مناڵەکان ئەسیر کرد و ئەوانی کردە کۆیلە و بەزیاد کردنی بەها (حەراج) ئەوانی لەبەڵخ فرۆشت. لەم کاتەدا چوارسەد و پەنجا کەس لەهاوەڵانی حارس، دژی ئەو شۆڕشیان کرد کەسەرکردەکەیان جەریر کوڕی مەیمونی دادیار بوو. حارس بەوانی وت: ئەگەر بەناچاری دەبێت لەمن جیا ببنەوە، بۆ خۆتان داوای ئەمان بکەن چوونکە من شایەتم و ئەوان، ئەمانتان پێدەبەخشن. ئەگەر پێش ئەمە، لێرە بڕۆم، ئەمان بەئێوە نادەن. وتیان: تۆ لێرە بڕۆ وئێمە بەخۆمان بسپێرە. کەسیان ڕەوانە کرد و خوازیاری ئەمان بوون. ئەسەدیان ئاگادار کردەوە کەئەم خەڵکە ئاو و خواردنیان نییە. ئەوجودەیعی کرمانی هاورێ لەگەڵ شەش هەزار کەس ڕەوانە کرد و گەمارۆی خستە سەر قەڵاکەی ئەوان. خەڵك گرفتاری برسیەتی و تینویەتی بوون و مەبەستی ئەومیان کرد لەسەر فەرمانی ئەو تەسلیم ببن بەو مەرجەی دەستدرێژی نەکرێتە سەر ژن و مناڵەکان. رازی بوو. ئەوان لەسەر فەرمانی ئەسەد تەسلیم بوون. ئەسەد کرمانی ڕەوانە کرد و فەرمانیدا پەنجا کەس لەگەورەکانی ئەوان بباتە لای ئەو کەیەکیان موهاجیر کوڕی مەیمون بوو. کرمانی ئەوانی ڕەوانە کرد، ئەسەدی نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا پاشماوەکان بۆ سێ دەستە دابەش بکات: یەك لەسەر سێی ئەوان بکوژێت و دەست و یەك لەسەر سێی ئەوان ببڕێتەوە و پێی یەك لەسەر سێی دیکەیان ببڕێت. کرمانی ئەو کارەی کرد و سامانەکانی ئەوانی تالان و فرۆشتی. ئەسەد شاری بەڵخی کردە پایتەختی خۆی و

دیوانی بۆ ئەو شارە گواستەوە. دواتر بۆ شەڕی تەخارستان و پانتاییەکانی حەبووە بەرێکەوت و تالآنی و ئەسیری زۆری دەستکەوت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، هوشام، خالید کوڕی عەبدولەلیك کوڕی حارس کوڕی حەکەمی لەفەرمانڕەوایەتی مەدینە لابرد و محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیلی لەجێگەی ئەودانا.

مەروان کوڕی محەممەد کوڕی مەروان لەئەرمەنستانەوە بەمەبەستی شەڕ کردن بەرێکەوت و لەسێ دەروازەوە، ڕۆشتە ناو شاری وەرنیس. وەرنیس لەبەرابەر هێرشەکەی ئەو بۆ لای خەزەر هەلآت و لەقەلآکەی خۆی، سەنگەری گرت. مەروان گەمارۆی خستەسەر و کەشنکەجیرەکانیان هەڵبەست. وەرنیس کوژرا. یەکێك لەکەسەکانی خۆی ئەوی کوشت و سەرەکەی بۆ مەروان ڕەوانە کرد. مەروان، سەری وەرنیسی لەپێش چاوی خەڵکان بەرم بەرز کردەوە. خەڵك، بەناچاری لەسەر فەرمانی ئەو تەسلیم بوون. شەڕکەرانیان کوشت و ژن و منداڵەکانیان کردە کۆیلە.

لەم ساڵەدا، عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس کۆچی دوایی کرد. مەرگی ئەو لەحومەیمە لەسەرزەمینی شام ڕوویدا. ٧٧ یا ٧٨ساڵ ژیا. دەڵێن: لەشەوێك چاوی بەدنیا هەڵهێنا کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب کۆچی دوایی کرد و لەبەر ئەمە باوکی ناوینا عەلی. وتی: ئەوم بەناوی خۆشەویسترین کەسی خۆمەوە ناونا. نازناوی ئەو نازناوی عەلی کوڕی ئەبی تالبە و بەباوکی حەسەن ناویان دەبرد. کاتێك باوکی حەسەن عەلی، ڕۆشتە لای عەبدولەلیك کوڕی مەروان، ڕێزی لێگرت و لای تەختەکەی، لەتەنیشت خۆی داینیشاند و پرسیاری نازناوەکەی کرد. وتی: باوکی حەسەن، عەلیم. عەبدولەلیك کوڕی مەروان وتی: هەرگیز نابێت لەناو سوپاکەی من، ئەم ناو و نازەناوە بەکەسێك ببڕێت. پرسی: کوڕت هەیە؟ وتی: بەڵێ، محەممەد. وتی: کەواتە تۆ باوکی محەممەدیت.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیل، فەرمانداری مەدینە ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. خالید کوڕی عەبدولەلیك فەرمانداری مەدینە و عێراق و سەراسەری ڕۆژهەلآت لەژێر فەرمانی خالیدی قەسریدا بوو. کارگوزاری خالید

لەخوراسان، براکەی ئەسەد کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری بوو و کارگوزارەکەی لەبەسرە بیلال کوڕی ئەبی بەردە و محەممەد کوڕی مەروان فەرمانڕەوایەتی ئەرمەنستانی دەکرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عوبادە کوڕی نوسەی سەرکردەی دادیاری ئەردەن، عەمرۆ کوڕی شوعەیب کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی عەباس کەلەتایف چاوی لەجیهان بەست. باوکی سەخرە جامع کوڕی شەداد، باوکی عەشابەی عامری و عەبدولرەحمان کوڕی سەلیت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نۆزدەی کۆچی (( ٧٣٧ زایینی ))

### کوژرانی خاقان

کاتێك ئەسەد گەیشتە خوتەل، کوڕی سایجی نامەی بۆ خاقان نووسی کە لەنەواکیس بوو. لەگەیشتنی ئەسەد بۆ خوتەل ئاگاداری کردەوە و پێی ڕاگەیاند کە، سوپاکەی لەوشارەدا بلاّو کردۆتەوە. کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت، فەرمانی خۆ ئامادە کردنی بەخەڵکەکەیدا و بەڕێکەوت. کوڕی سایجی کاتێك لەهاتنی خاقان ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ ئەسەد نووسی: لەخوتەل بڕۆدەر چوونکە سێبەری خاقان کەوتۆتە سەرسەرت. ئەسەد، جوێنی بەنێردراوەکەدا و وتەکانی بەڕاست نەزانی.

کوڕی سایجی پەیامی بۆ نارد: درۆم نەکرد. خۆم نامەم بۆ نووسی و ئاگادارم کردەوە کەتۆ هێرشت کردۆتە سەر ئەم پانتاییە و سوپاکەت بلاّو کردۆتەوە. ئەمە بۆ ئەو دەرفەتە. من داوای هاوکاریم کردووە. ئەگەر لەئێستادا ڕووبەڕوی تۆببێتەوە، سەرکەوتن بەدەست دێنێت و عەرەبەکان تا ئەو کاتەی زیندوویم، بەدوژمنی خۆیانم دەزانن. خاقان بەسەر منیشدا زاڵدەبێت و دەڵێت: عەرەبەکانم لەوڵاتەکەی تۆ دەرپەڕاند و پاشایەتیم بۆ تۆ گەڕاندەوە.

ئەسەد زانی کەکوڕی سایجی ڕاست دەکات. فەرمانیدا و باروبنەکەنیان بارکرد. ئیبراهیم کوڕی عاسمی عەقیلی بۆ ئەو کارە ڕاسپارد و پیرو پەککەوتەکانی لەگەڵ ئەو، ڕەوانە کرد. چەغانیەکان و چەغان خودان هاوڕێیەتیان کردن و ئەسەد لەخوتەلەوە مەبەستی ڕۆشتن بۆ کێوی خوێی کرد (جبل الملح). بڕیاریدا لەڕوبار بپەڕێتەوە. ئیبراهیم کوڕی عاسم، هاوڕێ لەگەڵ ئەسیرەکان و کەل و پەلەکان لەڕوبارە پەڕیبوونەوە. ئەسەد لەکەناری ڕوبارەکە دابەزی و ئەو ڕۆژەی بەسەر برد. کاتێك بەیانی داهاتن لەتەنکاوێکی ئاوەکە پەڕییەوە و خەڵك بەدوای ئەودا پەڕینەوە. خاقان بەوان گەیشتەوە وئەوانەی هێشتا دەرفەتی پەڕینەوەیان پێنەبڕابوو، کوشتار کران. کەرەستەکانی شەڕ، لەدەستی خەڵکانی ئەزد و تەمیمدا بوو. شەڕیان لەگەڵ خاقان کرد و دواتر بەپاشەکشێ ناچار بوون.

خاقان دابەزی و موسوڵمانەکان گومانیان کرد لەروبارەکە ناپەڕێتەوە. کاتێك خاقان روبارەکەی بینی، فەرمانی بەتورکەکاندا بپەڕنەوە وئەوان لەروبارەکە پەڕینەوە. موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر لەشکرگەکەی ئەوان. تورکەکان ئەوەی بینیان، هەڵیانگرت. کۆیلەکان گورز بەدەست هێرشیان کردنە سەر و ناچار بەپاشەکشێ بوون. ئەسەد و موسوڵمانەکان شەویان بەئامادە کردنی خۆیان بەسەر برد و کاتێك بەیانی داهات، بینیان خاقان لەوێ نەماوە. لەگەڵ هاوەڵانی راوێژی کرد. وتیان: ئاسودەیی و ئارامی باڵی بەسەرماندا کێشاوە. وتی: ئەمە ئاسوودەی نییە، گرفتارییەکی گەورەیە. خاقان دوێ شەو هێرشی کردەسەرمان و زیانی پێگەیاندین. ئەوەی ئەمرۆ بۆتە هۆی ئەوەی لێرەنەمێنێت، ئەومیە کەدەستەیەك لەئەسیرەکان ئەویان لەشوێنی کەل و پەلەکانمان ئاگادار کردۆتەوە و خاقان بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئەوشتانە، ئێرەی بەجێهێشتوە.

ئەسەد بەرێکەوت وپێشەنگەکانی رەوانە کرد. کاتێك شەو داهات، لەگەڵ خەڵکان راوێژی کرد کەدابەزێت یا درێژە بەرێگەکەی بدات. وتیان: ئاسوودەی باڵی بەسەردا کێشاوین. لەناوچوونی سامانەکان لەبەرابەر تەندروستی خوراسانییەکان و رزگاری ئێمە، بەهایەکی ئەوتۆی نییە. نەسر کوڕی سەیار سەری داخستبوو. ئەسەد وتی: بۆ بێدەنگیت؟ وتی: فەرماندار، دوو رێگەت هەیە، هەرکامیان هەڵبژێرێت، لەبەرژەوەندی تۆ، کۆتایی پێدێت. ئەگەر درێژە بەم رێگایە بدەیت و هاوکاری ئەو کەسانە دەکەیت کەهاورێی ساز و بەرگ و کەرەستە و کەل و پەلەکانی تۆن و رزگاریان دەکەیت، ئەگەر کاتێك دەگەیتە لای ئەوان کە کوشتار کرابێتن، رێگەیەکەت بڕیوە کەبەناچاری دەبێت بیبڕیت. بۆچونەکەی پەسەند کرد و درێژەی بەرێگەکەدا. ئەسەد، سەعیدی گەورە، موالی باهیلەی بانگ کرد. سەعید، یەکێك بوو لەسوارکاران و شەرکەرانی خوتەل. بەودا نامەیەکی بۆ ئیبراهیم نووسی و فەرمانی خۆ ئامادە کردنی پێدا. لەهێرشەکەی خاقان ئاگاداری کردەوە: پەیامیدا: ئەگەر تۆ گیان ببەخشیت و من ئەسپ لەتۆ درێغ بکەم، بێ گومان کەسێك دوور لەبەها ئەخلاقیەکانم. ئەسپەکەی پێدا و بەرێکەوت.

کاتێك لەتورکەکان نزیك کەوتەوە و بینی مەبەستی هێرش کردنە سەر کەل و پەلەکانیان هەیە، پێشەنگەکانی ئەوان مەبەستی گرتنی ئەویان کرد. بەلام سوار زەبووب

بوو و تورکەکان نەیانتوانی بیگرن. ئەو نامەکەی ئەسەدی بەئیبراهیم گەیاند. خاقان هێرشی کردە سەر کەل و پەل و باروبنەکە. ئیبراهیم سەنگەری هەڵکەند. خاقان کاتێك گەیشتە لای ئەوان کە لەسەر سەنگەرەکان وەستابوون. فەرمانی شەڕ کردنی بەسەغدیەکاندا بەڵام موسوڵمانەکان شکستیان پێهێنان. خاقان ڕۆشتە سەر تەپۆڵکەیەك و سەیری ئەم لاولای کرد تا شوێنێکی گونجاو دەستنیشان و لەوێوە هێرشیان بکاتەسەر. کاتێك بەتەپۆڵکەکەدا سەرکەوت، لەپشتی سوپاکەوە دورگەیەکی بینی کە لەشوێنێکیدا ئاوەکەی کەم بوو. یەکێك لەفەرماندە تورکەکانی بانگ کرد و فەرمانی پێدا تورکەکان لەسەرەوەی سوپای موسوڵمانەکان لەئاوەکە بپەڕنەوە و خۆیان بەدوورگەکە بگەیەنێن تا لەپشتەوە هێرش بکەنە سەر سوپای موسوڵمانان و سەرەتا هێرش بکەنە سەر عەجەمەکان و چەغانییەکان. بەوانی وت: ئەگەر هێرش بکەنە سەر ئێوە، ئێمە لێرەوە هێرشیان دەکەینە سەر. ئەو کارەیان کرد و لەشوێنی عەجەمەکانەوە ڕەوانە بوون و چەغان خوداە و هەموو شەڕکەرانی ئەویان کوشتار و سامانەکانیان تاڵان کردن. هەروەها ڕۆشتە ناو لەشکرەکەی ئیبراهیم و تاڵانی کرد. موسوڵمانەکان لەسەنگەرەکان دوورکەوتنەوە و لەشوێنێکدا کۆبوونەوە و دڵنیا بوون لەمەرگ نزیك بوونەتەوە. لەناکاو بینیان تەپ و تۆز لەئاسمان بەرز بۆتەوە. ئەسەد بوو کەهاورێ لەگەڵ سوپاکەی بۆ هاوکاری ئەوان هاتبوو. تورکەکان لەبەرابەر هێرشەکەی ئەسەد، بۆ سەر تەپۆڵکەکەی خاقان، سەنگەرەکانیان گواستەوە. ئیبراهیم سەریسوڕما، بۆچی لەناکاو تورکەکان دەستیان لەشەڕ کردن هەڵگرت لەکاتێکدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو و هەموو سامانەکانیان تاڵان کردبوو. چاوەڕوانی هاوکاری ئەسەدی نەدەکرد. بەخێرای بۆ لای ئیبراهیم ئەسپی غاردا و ڕۆشتە سەر ئەو تەپۆڵەکەی خاقان وەستابوو. خاقان پەنای بۆ داوێنی کێوەکە برد. ئەوانەی سامانەکانیان تاڵانکرابوو، ڕوبەڕوی ئەسەد بوونەوە و ژمارەیەکی فراوان لەوان کوشتار کران.

خاقان لەگەڵ ئەسیر و وشترە بارقورسەکان و کچە کردار شیرینەکانی خۆی ڕێگەی دەبڕی و فەرمانی بەیەکێك لەهاوەڵانی حارسدا جار بدات: تۆ چاوی تەماحت بڕیوەتە ئەوبەری ڕووبار. دەتوانی لەخوتەل کەسەرزەمینی باوك و پێشینانی منە، چاو بپۆشیت. ئەسەد وتی: ئەگەری هەیە خواوەند تۆڵە لەتۆ بستێنێتەوە.

ئەسەد بەرەو بەلْخ بەرێکەوت و لەشوێنێکی سەرسەوز دابەزی تا زستان داهات. خەڵکانی بەسەر ماڵەکاندا دابەش و جێگیری کردن و خۆی ڕۆشتە ناو شارەکە. حارس کوڕی سورەیح لەپانتاییەکانی تەخارستان پەیوەستی خاقان بوو. کاتێك زستان لەنیوە، نزیك کەوتەوە، خاقان هات. ئەو کاتەی ئەسەد هاتبووەدەر، ئەو ڕۆشتبوویە تەخارستان و لەحەبوویە مابوویەوە. بەلاّم لەنێستادا هێرشی کردە سەر جوزجان و دەستی بەپەلامار و داگیرکاری کرد.

هۆکاری هاتنەکەی ئەوە بوو: حارس ئاگاداری کردەوە کەچیتر ئەسەد ناتوانێت پشت ڕاست بکاتەوە چوونکە سوپایەکی ئەوتۆی لەگەڵدا نەماوە. خاقان لەجەزیرە دابەزی. ئەم هەواڵە بەئەسەد گەیشت کەخاقان ڕۆشتۆتە ناو جەزیرە. فەرمانیدا لەشارەکەدا ئاگرێکی بڵێسەدار بکەنەوە. خەڵك لەگوندەکانەوە روویان لەوێ کرد. ئەسەد شەوی کردە ڕۆژ و نوێژی جەژنی (قوربانی) خوێند. وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە و وتی: دوژمنی خواوەند (حارس) ئەم ستەمکارە سەرکێشەی بۆ ئێرە ڕێنوێنی کردووە تا روناکی خواوەند بکوژێنێتەوە و ئایینەکەی خواوەند بگۆڕێت بەلاّم خواوەند، ریسوا و لاوازی دەکات. دوژمنانی ئێوە ئەو بەلاّیان بەسەر سامان و گیانی ئێوەدا هێنا کەئاگادارن لێی. ئەگەر خوا مەبەستی ئەوە بکات سەرکەوتنتان پێببەخشێت، کەم بوونی ژمارەتان زیانتان لێنادات و فروانی بوونی ژمارەی سوپاکەی ئەوان، سوودیان پێناگەیەنێت. لەخوا بپاڕێنەوە و بزانن نزیکترین کاتی بەندەکان لەگەڵ پەروەردگار، ئەو کاتەیە کەسەری کوڕنوش دادەنەوێنێت. من کوڕنوش دەبەم و سەر لەخاك دەسووم. ئێوەیش ئەوکارە بکەن و بەگیان و دڵ لەخواوەند بپاڕێنەوە. ئەو کارەیان کرد و کاتێك سەریان بەرز کردەوە، گومانیان نەدەکرد کەخواوەند سەرکەوتنیان پێدەبەخشێت. ئەسەد هاتەخوار و قوربانی کرد و سەبارەت بەشەڕ کردن لەگەڵ خاقان راوێژی لەگەڵ خەڵکان کرد. دەستەیەك وتیان: پارێزگاری لەشاری بەلْخ بکە و بۆ خالید و خەلیفە نامە بنووسە و داوای هاوکاریان لێبکە. دەستەیەکی دیکە وتیان: بەرەو زەم بەرێکەوە و پێش خاقان بڕۆ ناو شاری مەرو. دەستەیەکی دیکە وتیان: روبەرویان ببەرەوە. ئەسەد ئەم بۆچونەی پەسەند کرد چوونکە مەبەستی ئەوەی کردبوو شەڕ لەگەڵ ئەوان تاقیبکاتەوە. هاوڕێ لەگەڵ حەوت هەزار پیاوی شەڕکەر لەخەڵکانی خوراسان و شام هاتەدەر و کرمانی کوڕی

عەلی وەك جێگری خۆی لەبەلْخ دەستنیشان كرد و فەرمانی پێدا رێگە نەدات كەس لەشارەكە بڕواتەدەر، تەنانەت ئەگەر توركەكان دەروازەكانیش بگرن. لەسەر یەكێك لەدەروازەكانی بەلْخ دابەزی و دوو ركعەت نوێژی خوێند. نوێژی درێژ كردەوە. كاتێك تەواو بوو، وتی: سوێند بەپەروەردگاری كەعبە، بەئیرادەی خواوەند، سەركەوتنتان بەدەست هێناوە. كاتێك لەپردی عەتا تێپەڕی، دابەزی تا پاشماوەی سوپاكەی پەیوەستی ببن. بەلاَم دواتر فەرمانی بەرێكەوتنیدا و وتی: پێویستمان بەوان نییە.

بەرێكەوت. فەرماندەی پێشەنگەكانی ((سێسەد پیاوی شەڕكەر))) سالم كوڕی مەنسوری بەجەلی بوو. ئەوان روبەروی سێسەد شەڕكەری تورك ((پێشەنگەكانی خاقان)) بوونەوە. فەرماندەی ئەوان وحەوت كەسی دیكەیان ئەسیر كرد و ئەوانیتر هەلاَتن. ئەویان بردە لای ئەسەد و پیاوی تورك دەستی بەگریان و پاڕانەوە كرد. وتی: بۆ دەگرییت؟ وتی: بۆ خۆم ناگریم بەلْكوە بۆ لەناوچونی خاقان دەگریم چوونكە ئەو سوپاكەی تا مەرو بلاَوە پێكردووە.

ئەسەد بەرێكەوت تا لەشاری جوزجان نزیك كەوتەوە و لەدوو فەرسەخی خاقان دابەزی. خاقان شارەكەی تالاَن كردبوو. كاتێك بەرەبەیان نزیك بوویەوە، دوو سوپا توانیان یەكتر ببینن. خاقان بەحارس كوڕی سورەیحی وت: پێت وتم ئەسەد لەشوێنەكەی خۆی ناجوولێت بەلاَم ئێستا هاورێ لەگەلْ ئەم سوپایە هاتووە. ئەی ئەمە كێیە؟ وتی: ئەوە محەممەد كوڕی موسەنایە و ئەومیش ئالاَكەیەتی.

خاقان پێشەنگەكانی ڕەوانە كرد و وتی: بڕوانن و بزانن وشترانی تەخت و پاشایەتی دەبینن. گەڕانەوە و وتیان: بینیمان. وتی: ئەسەد هاتووە.

ئەسەد بەئەندازەی مەودای تیرێك ئەسپی غاردا. سالم كوڕی جوناح چاوی پێیكەوت و وتی: فەرماندار، مژدەت لێ بێت كەسەركەوتنتان بەدەست هێناوە. ژمارەی ئەوان ناگاتە چوار هەزار پیاوی شەڕكەر و بەفەرمانی خواوەند خاقان لەناو دەچێت. ئەسەد سوپاكەی خۆی ئامادە كرد و خاقانیش بەهەمان شێوە. كاتێك رووبەرووی یەك بوونەوە، حارس و هاورێكانی لەخەلْكانی سەغد و كەسانیتر هێرشیان دەستپێكرد. ئەوان لەقوَلْی راستی سوپاكەی خاقاندا جێگیر بوون و هێرشیان كردە سەر بالْی چەپی سوپاكەی ئەسەد. شكستیان بەسوپاكەی ئەسەد هێنا و تا خێوەتەكەی ئەسەد كەس بەرگری نەكرد.

شەرکەرانی باڵی چەپی سوپاکەی ئەسەد، لەخەڵکانی جوزجان و ئەزد و تەمیم هێرشیان دەستپێکرد و حارس و هاوەڵانی پاشەکشێیان کرد و هەڵاتن. تورکەکان بەگشتی هەڵاتن و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن. تورکەکان لەو دەشتە پان و بەرینەدا بڵاو بوونەوە و ئاوڕیان نەدایەوە. خەڵکان تا سێ فەرسەخ شوێنیان کەوتن و هەرچەندە توانیان کوشتاریان کرد تا گەیشتنە مەڕوماڵاتەکانی خۆیان. سەد و پەنجا هەزار سەر مەڕ و ژمارەیەکی فراوان چوارپێ و مەڕوماڵاتی دیکەیان دەستکەوت.

خاقان ڕێگەی کێوی گرتەبەر. حارسی تێکشکاو کەهەڵاتبوو، پارێزگاری لێدەکرد. جوزجانی بەعوسمان کوڕی عەبدوالله کوڕی شێخەیری وت: من لەوڵات و سەرزەمینی خۆم و ڕێگەکانی شارەزاترم، ئایا فەرمانەکانم جێبەجێ دەکەیت بۆ ئەوەی خاقان لەناو ببەین؟ وتی: بەڵێ. ئەم دووانە ڕێگەیەکیان گرتەبەر و لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان بەرێکەوتن تا لەخاقان نزیك کەوتنەوە و هێرشیان کردەسەر. ئەو شکستی خوارد و هەڵات. موسوڵمانان لەشکرگەی تورکەکانیان تاڵان کردو سامانەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا. لەناو لەشکرگەکەی خاقان، ژنانی عەرەب و موالیەکان و ژنانی تورکیان بینی. مایینەکەی خاقان لەقور چەقی. حارس کوڕی سورەیح پارێزگاری لێدەکرد و خەڵکان نەیاندەزانی خاقانە. پیاوێکی خەساو هاوڕێیەتی خاقانی دەکرد. مەبەستی کرد ژنەکەی خاقان رزگار بکات تا نەبێتە ئەسیری موسوڵمانان. موسوڵمانان پێشی کەوتنەوە. پیاوی خەساو ژنەکەی کوشت و ئەوان موسوڵمانە گرفتارەکانی دەستی خاقانیان رزگار کرد.

ئەسەد تا مەرو رود شوێن سوارەکانی تورك کەوت کەخاقان بۆ داگیرکاری ڕەوانەی کردبوون. هەر کەسێکی گرت، کوشتی و تەنیا دەستەیەکی کەم رزگاریان بوو. ئەسەد بۆ بەڵخ گەڕایەوە. بیشر کرمانی لەگەڵ شەڕکەراندا بوو. شەڕکەرانی موسوڵمان یەك یەك یا دوو دوو تورکەکانیان ئەسیر دەکرد.

خاقان رووی کردە تەخارستان و لای حەبوویەی خەزلەجی مایەوە و لەوێوە بۆ وڵاتەکەی خۆی گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە ئەشروسەنە، خەرابگەرە، باوکی خاناگەژە، پێشوازی لێکرد. ئەو باوەگەوڕێی کاووس باوکی ئەفشین بوو. بەهەموو تواناکانی خۆی، هاوکاری خاقانی کرد. ئەم دووانە لەیەك دوور بوون بەڵام ئەو دەیویست بەشێوەیەك پارێزگاری لەخاقان بکات و پێگەی خۆی بەرزبکاتەوە. خاقان ڕۆشتە وڵاتەکەی خۆی و بۆ

شەڕی موسوڵمانان و گەمارۆ خستنە سەر سەمەرقەند خۆی ئامادە کرد. حارس و هاوەڵانی سوار پێنج هەزار مایین کرد. ڕۆژێك خاقان لەسەر خواستێکی گران لەگەڵ کورسوڵ تاوڵەی کرد. ئەم دوو هاوشەڕە هاتنەدەر. کورسول لەدەستی خاقانیدا و شکاندی. خۆی بەدوور گرت و سوپایەکی کۆکردەوە و بیستی کەخاقان سوێندی خواردوە دەستی ئەو دەشکێنێت. بەشێوەیەك، لەشوێنێك، لەسەر ڕێگەی خاقان دانیشت و کوشتی. تورکەکان بلاَّویان لێکرد و ئەویان بەتەنیا بەجێهێشت. چەند پیاوێکی تورك گەڕانەوە و بەخاکیان سپارد. تورکەکان دەستیان بەتالاَن کردن و کوشتاری یەك کرد. لەم کاتەدا خەڵکانی سەغد هیوادارن بوون بۆ وڵاتەکەی خۆیان بگەڕێنەوە.

ئەسەد کەسێکی مژدەبەخشی بۆ دەرباری هوشام کوڕی عەبدولمەلیك ڕەوانە کرد و ئاگاداری کردەوە کەخوا سەرکەوتنی پێبەخشیوە و خاقانی کوشتووە. هوشام وتارمەکەی ئەوی بەڕاست نەزانی و بەدەرگاوانەکەی خۆی، ڕەبیعی، وت: ئەم پیاوە بەڕاستگۆ نازانم، بڕۆ مژدەی پێبدە و بزانە چی دەڵێت. ئەو کارەی کرد. نێردراو هەمانی بەدەرگاوان وت کەبەهوشامی ڕاگەیاندبوو. ئەسەد کەسێکی دیکەی ڕەوانە کرد کە لەبەردەم کۆشکەکەی هوشام وەستا و تەکبیری وت: هوشام وەڵامی تەکبیرەکەی دایەوە. کاتێك گەیشتە لای هوشام، مژدەی سەرکەوتنی پێبەخشی. هوشام سەری کوڕنوشی دانەواند و سپاسی خواوەندی کرد. خەڵکانی قەیس ڕژدیان بەئەسەد دەبرد و بەهوشامیان وت: نامە بنووسە و موقاتیل کوڕی حەییانی نەبتی بانگ بکەرەوە. هوشام نامەی نووسی و ئەسد ئەوی بۆ لای هوشام ڕەوانە کرد. کاتێك ڕۆشتە لای، لەهەموو ڕووداوەکانی پێشوو ئاگاداری کردەوە. هوشام وتی: چ نیازێکت هەیە؟ وتی: یەزید کوڕی موهەلیب، سەد هەزار درەمی بەناڕەوا لەباوکم وەرگرتووە، لێی وەربگرە و بۆ منی بگەڕێنەرەوە. هوشام نامەی بۆ ئەسەد نووسی و فەرمانی ئەو کارەی پێدا. ئەسەد پارەکەی بۆ موقاتیل گەڕاندەوە. موقاتل، ئەو بڕە پارەی لەسەر بنەمای نووسراوی خواوەند، لەناو میراتبەرانی حەییاندا دابەش کرد.

باوکی هیندی سەبارەت بەم ڕووداوە، دەڵێت:

ابا منذر رمت الامور و قستها      و ساءلت عنها کاالحریص المساوم

فما کان ذورای من الناس قسته      برأیك الا مثل رأی البهائم

ابا منذر لولا مسيرك لم يكن عراق ولا انقادت ملوك الاعاجم

ولا حج بيت الله من حج راكبا و لا عمر البطحاء بعد المواسم

وكم من فتيا بين سان و جزة كسير الايادى من ملوك قماقم

تركت بالرض الجوزجان تزوره سباع و عقبان لحز الغلاصم

وذى شوقة فيه من السيف خبطة به رمق ملتى لحوم الحوائم

فمن هارب منا و من دائن لنا اسير يقاسيى مبهمات الاداهم

فدتك نفوس من تميم و عامر و من مضر الحمراء عند المآزم

هم اطمعوا خاقان فينا اصبحت حلائبه ترجو خلو المغانم

یانی: ئەی باوکی مونزەر، لەسەر بنەمای راستی مەبەستی کارەکانت کرد و هاوشێوەی تەماحکارێکی مامڵەچی، هەموو جۆرە پرسیارێکت لەو بارە پرسی. هیچ فرەزانێك لەخەڵکان نەبوو، خۆت بەو هەڵسەنگێنیت مەگەر ئەوەی لەبەرابەر تۆ هاوشێوەی چوارپێکان دەرکەوت. ئەی باوکی مونزەر، ئەگەر هەوڵ و تێکۆشینەکانی تۆ نەدەبوو، نەعێراق دەمایەوە و نەپاشاکانی ئێران ملکەچ دەبوون. ئەو کەسەی مەبەستی سەردانی ماڵی خواوەندی دەکرد، نەیدەتوانی، سوار لەسەر ئەسپ بڕواتە مەککە و نەدەیتوانی لەدوایی ئایینەکانی حەج، بەمەبەستی بەتحاء جل و بەرگی عەمرە بپۆشێت. چەندە کوژراوی زۆر لە(سان، یەکێك لەگوندەکانی بەلخ) و جەزە کەوتنە سەرزەوی و چەند زۆر پاشای بەخشندە، دەستەکانیان تێکشکا و لەم جیهانە کورت بوویەوە. ئەوانت لەدەشتە پان و بەرینەکان جوزجان لەسەرزەمینێك بەجێهێشت کەوەحشی و لاشخۆر و کەمتیارەکان، سەرقاڵی خواردنی گۆشتی قوڕگیانن. چەندە زۆرن ئەو خەڵکە ژێردەستانەی تامی گەستنی تێغی بێ ئامانیان چێشت و نیوە گیانێکیان بۆ مایەوە کە بوو بەخواردنی کەمتیار و لاشخۆرەکان. یەکێك پشتی کردە ئێمە و هەڵات و یەکیتر قەرزار و گرفتاری بەدبەختییەکان. گیانی عەمرۆ و تەمیم قوربانی تۆبن هاورێ لەگەڵ موزەرییە سورباوەکان کەدەتوانن لەگێژاوەکان فریات کەون. ئەوان بوون خاقانیان تەماحداری ئێمە کرد و ئێستاکە چوارپێ تیژپێکانی، چاوەڕوانی خاڵی بوونەوەی بەدەست هێنراوەکانیەتی.

کوڕی سایجی کەئەسەدی لەهاتنی خاقان ئاگادار کردەوە، جێگری سەبل بوو کەلەکاتی

مردنی، ئەوی وەك جێگری خۆی دەستنیشان و پێشنیاری سێ کاری پێکرد. وتبووی: هاوشێوەی من سەرکێشی و دەستدرێژی مەکەرە سەر خەڵکانی خوتەل چوونکە من پاشام بەڵام تۆنا بەئکو یەکێکیت لەوان. وتبووی: بەدوای حەنیشدا بگەرێ و بیهێنە بۆ شارەکەی خۆت چوونکە دوای من ئەو پاشایە. حەنیش بۆ چین هەڵاتبوو. هەروەها وتبووی: لەگەڵ عەرەبەکان شەرمەکەن و بەهەر شێوەیەك دەتوانن، پارێزگاری و بەرگریان لێبکەن. کوڕی سایجی وتبووی: ئەوەی کەدەڵێیت: دەستدرێژی مەکەرە سەر ئەوان و حەنیش بگەرێنەرەوە، بۆچوونێکی راستە وچاکەخوازی من بوویت کەپێشنیاری ئەو کارانەت پێکردم. بەڵام ئەوەی کەوتت: شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان مەکەن، چۆن بەم وتەیە رازی ببم لەکاتێکدا خۆت پێشتر شەڕت لەگەڵ ئەوان تاقی کردۆتەوە؟ سەبل وتبووی: هێزی خۆم و هێزی ئێوەم بەراوەرد کرد و بینیم ناتوانن هێز و دەسەڵاتی من بەدەست بێنن. منیش هەرجار کەشەڕم لەگەڵ ئەوان کرد، بێزار و پەرێشان بووم و لەدەست ئەوان هەڵاتم. ئێوە ئەگەر شەڕیان لەگەڵ بکەن، لەناو دەچن. بەهۆی ئەم پێشنیارانەوە بوو کوڕی سایجی شەڕ کردن لەگەڵ عەرەبەکانی پەسەند نەدەکرد.

## کوژرانی بەییان و موغەیرە کوڕی سەعید

لەم ساڵەدا بەییان و موغەیرە کوڕی سەعید و شەش کەسی دیکە، یاخی بوون و سەرپێچی کردنی فەرمانەکانیان دەستپێکرد. ئەوانیان بەنەوجەوانان ناو دەبرد. موغەیرە جادووگەر بوو و دەیوت: ئەگەر بمەوێت عاد و سەموود و چەندین نەوە لەنێوان ئەوان زیندوو بکەمەوە، دەتوانم. خالید کوڕی عەبدوڵلای قەسریان ئاگادار کردەوە کەئەوان لەپشت کوفەوە شۆڕشیان دەستپێکردووە ((لەم کاتەدا سەرقاڵی وتار خوێندنەوە بوو)) وتی: ئاوم بۆ بێنن. یەحیا کوڕی نەوفل لەمبارەوە دەڵێت:

اخالد لا جزاك الله خيرا — و اير فی حر امك من امير

و كنت لدی المغيرة عبد سوء — تبوول من المخافة للزئير

و قلت لما اصابك اطعمونی — شرابا ثم بلت علی السرير

لا علاج ثمانية و شيخ — كبير السن ليس بذی نصير

یانی: ئەی خالید، خوا پاداشتی چاکەت نەداتەوە، ئەگەر تۆ فەرمانداری، کێر بەقوزی

دایکت. تۆ فەرمانداریکی خراپیت. تۆ لەبەرابەر موغەیرە کۆیلەیەکی ریسوا بوویت کە لەترسی نەڕەی شێر، خۆتت پیس کرد. لەزیانی ئەو بەلای بەسەرتۆدا هات، وتت: ئاوم بۆ بێنن. دواتر لەسەر تەخت گمیزت کرد بەخۆتا. لەترسی هەشت پیاوی گەردن کێش و پیرە پیاوێکی پەککەوتە کەهیچ پشتیوانێکی نییە.

خالید کەسی رەوانە کرد و ئەوانیان هێنا. فەرمانیدا و تەختەکەیان بردە شوێنێك لەدەرەوەی مزگەوت. فەرمانیدا ونەوتیان هێنا و ئەوانیان خستە ناو ئاگرەوە و سوتاندنی. کەسی بۆ لای مالکی جەرمی ڕەوانە کرد و پرسیاری لێکرد. ئەو راستیەکانی بەخالید وت و ئازادی کرد.

## ئەندێشە و وتارەکانی موغەیرە

ئەندێشەکەی ئەوە بوو: خواوەند جەستەی هاوشێوەی جەستەی مرۆڤەکانی هەیە. دەیوت: خواوەند لەپیاوێك دەچێت تاجی لەسەر کردبێت. ژمارەی ئەندامەکانی ئەو بەئەندازە پیتەکانی ئالفابێتە و ئەو شتانە دەڵێت کەخۆی نایانهێنێتە سەرزمان. دوورە خواوەند لەم هەڵیت و پڵیتانە. دەیوت: کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد ئافرێنراوەکانی بئافرێنێت، ناوی گەورەی خۆی هێنایە سەرزمان کەهەڵفڕی و لەسەر تاجەکەی نیشتەوە. دواتر بەپەنجەی خۆی، کاری بەندەکانی بەچاك و خراپ لەبەری دەستیا نووسی. کاتێك گوناحەکانی بینی، عارەق بەروخساریدا هاتەخوار. لەعارەقی ئەو دوو دەریا دروست بوو: یەکیان سوێر و تاریك و ئەوی دیکەیان شیرین و رۆشن. دواتر سەری دانەوند و لەدەریای ڕوانی. سێبەری خۆی بینی و بەرێکەوت تا بیگرێت بەلام سێبەر پەڕی و خواوەند گرتی و هەر دووچاوی سێبەرەکەی هەڵکەند و لەناوی برد و لەدوو چاوی، خۆر و ئاسمانێکی دیکەی ئافراند و لەدەریای سوێر ناباوەڕان و لەدەریای شیرین باوەڕدارانی ئافراند. ئەو عەلی بەخواوەند دەزانی و ئەبووبەکر و عومەر و هاوەلانی دیکەی پێغەمبەری بەناباوەڕ لەقەڵەمدەدا مەگەر ئەو کەسانەی شوێنکەوتەی عەلی بوون. دەیوت: پێغەمبەران هیچ ناسازگاری و جیاوازییەکیان لەئایینەکانی خۆیاندا نییە. دەیوت: خواردنەوەی ئاوی فورات و هەر سەرچاوەیەکی دیکە کەپیسایی تێبرژێت، ناڕەوایە. ئەو دەرۆشتە گۆڕستان و لەگەڵ مردووەکان قسەی دەکرد و ئەوسا پەیکەرەکان

هاوشێوەی کوللە دەردەکەوتن.

موغەیرە ڕۆشتەی لای ئیمام باقر و پێی وت: شایەتی بدە کەتۆ زانستی نهێنیەکان و نادیارەکانت هەیە تا هەموو عێراق بکەمە شوێنکەوتەی تۆ. ئیمام باقر ئەوی سەرکۆنە کرد و لەخۆی دوور خستەوە. ڕۆشتە لای جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی سادق و قسەکانی دووبارە کردەوە. جەعفەر وتی: لەم هەڵیت و پڵیتانە، پەنا بۆ خواوەند دەبەم! شەعبی بەموغەیرەی دەوت: ئیمام چی کرد؟ دەیوت: گاڵتەی پێدەکەیت؟ دەیوت: نا گاڵتە بەتۆ دەکەم.

بەڵام لەوتەکانیدا، باوەڕی بەخوایەتی حەسەن و حسێن و دوای ئەوان محەممەد کوڕی حەنیفە بوو، دوای ئەو، کوڕەکەی باوکی هاشم کوڕی محەممەد. بەسووڕانی گیان لەناو جەستەکان، ((تەناسوخ) باوەڕی بوو. دەیوت: روخساری پەروەردگاری تۆ دەمێنێتەوە کە خاوەن شکۆ و بەرێزە ((رحمان/ ٢٧/٥٥)) خواوەند لەوەی ستەمکاران و نەزانەکان دەیهێنە سەرزمان، گەورەترە. ئەو خۆی وەك پێغەمبەر ناساند و وتی: مەبەستی خوای گەورە لەم ئایە منم: ئەم گێڕانەوەیەکی ئاشکرا بۆ خەڵکانە ((ال عمران/ ٣/ ١٨٣).

## بەسەرهاتی خەواریج

لەم ساڵەدا بۆهلوول کوڕی بێشر ناسراو بەکوسارە، لەموسڵ لەخەڵکی شەیبان، شۆڕشی دەستپێکرد.

دەڵێن: هۆکاری شۆڕشەکەی ئەوەبوو کەکۆیلەکەی خۆی ڕەوانە کرد تا بایی یەك درەم سرکەی بۆ بکرێت. ئەو شەرابی پاکی بۆ هێنا. فەرمووی دەیگەڕێنێتەوە و درەمەکانی وەردەگرێتەوە.. شەراب فرۆش رازی نەبوو. بۆهلوول ڕۆشتە لای فەرمانڕەوای گوندەکە لەخەڵکی سواد و قسەی لەگەڵ کرد. فەرمانڕەوا وتی: شەرابی تاڵ لەوتارە شیرینەکەی تۆ باشترە. بۆ حەج بەرێکەوت و مەبەستی شۆڕشی لەسەردا پەروەردە کرد. لەمەککە لەگەڵ ئەو کەسانی هاورێی کۆبوویەوە. یەکێك لەگوندەکانی موسڵیان وەك شوێنی کۆبوونەوەی خۆیان دەستنیشان کرد. ژمارەیان چل پیاوی شەڕکەر بوو. لەو گوندە کۆبوونەوە. بۆهلوولیان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد و کارەکەی خۆیان لەخەڵکان شاردەوە. لای

هەر کام لەکارگوزاران تێپەڕین، پێیان وت لەلایەن هوشام کوڕی عەبدولمەلیکەوە بۆ ئەنجامدانی کارێك هاتوون. بەم بیانووە چواربێکانی تایبەت بەپەیك و نامەبردنیان لەوان وەردەگرت. کاتێك گەیشتنە ئەو گوندەی کۆیلەکەی شەرابی لەوێ کڕیبوو، بۆهلوول وتی: لەم فەرمانداڕەوە دەست پێدەکەین و دەیکوژین. هاوەڵانی وتیان: ئێمە دەمانەوێت خالید بکوژین، ئەگەر لێرەوە دەستپێبکەین، کارەکەمان ئاشکرا دەبێت و خالید خۆی دەپارێزێت و کەسانی دیکەیش بەهەمان شێوە. سوێندت دەدەین بەخوا ئەو مەکوژە چوونکە دەستمان بەخالید ناگات. ئەوە کەمزگەوتەکان وێران و کەنیسەکان ئاوەدان دەکاتەوە و ئاگرپەرستەکان پێش موسوڵمانان دەخات و ژنانی موسوڵمان دەکاتە هاوسەری کەسە ئەمان بەخشراوەکان. ئەگەری هەیە بتوانین ئەو بکوژین و خواوەند زیانی ئەو لەخەڵکان دوور بخاتەوە. بۆهلوول وتی: سوێندە بەخوا، ئەوەی لەسەر من پێویستە، پشتگوێی ناخەم و هیوادارم بتوانم ئەم پیاوە و خالید بکوژم. ئەوی کوشت و خەڵکان ئاگادار بوونەوە و زانیان کەئەوان خەواریجن. هەڵاتن. پەیکەکان گەیشتنە لای خالید و ئاگاداریان کردەوە بەڵام نەیانزانی کێ ڕێبەرایەتی ئەوان دەکات.

خالید لەواستەوە بەرێکەوت و هاتە حیرە. سوپایەك لەخەڵکانی شام لەوێ بوون کە بۆ هاوکاری کردنی کارگوزاری هیند هاتبوون. خالید فەرمانی شەڕ لەگەڵ خەواریجی پێدان و وتی: هەرکەس یەك کەس لەوان بکوژێت، بەخششەکانی زیاد دەکەم و لەڕۆشتن بۆ هیند دەیبەخشم. ئەوان بۆ شەڕی خەواریج ئەسپیان غاردا. سەرکردەکەیان لەمتاڵەکانی ڤین بوو. لەگەڵ شەشسەد کەس بەرێکەوت و خالید دووسەد کەس لەپاسەوانەکانی خۆی پەیوەستی ئەو کرد. لەسەر کەنارەکانی فورات چاویان بەیەککەوت. ڤینی بەپاسەوانەکانی وت: هاوڕێیەتی ئێمە مەکەن. ((دەیویست سەرکەوتنەکە تایبەت بەخۆی و سوپاکەی بێت)). بۆهلوول هێرشی کردەسەر ڤینی و ڕمێکی لێدا و جەستەی لەت لەت و جیهانی لەو پاك کردەوە. خەڵکانی شام و پاسەوانەکان کوشتار کران و بۆهلوول و سوپاکەی، شوێنیان کەوتن تا بۆ ناو کوفە پاشەکێیان پێکردن.

خەڵکانی شام سوار ئەسپە تیژپێکان بوون. هەڵاتن و خۆیان ڕزگار کرد. بەڵام پاسەوانەکانی کوفە، کەوتنە بەردەستی و کاتێك خۆیان بەگرفتار بینی، وتیان: لەخوا بترسە چوونکە کەسانێکی ژێردەستە و سەرکوت کراوی بێ دەرەتانین. بۆهلوول بەڕم

دەیكێشا بەسەریاندا و دەیوت: ڕابكەن، ڕابكەن. كیسەیەكی زێری لەناو كەل و پەلەكانی فینی بینی و هەڵیگرت.

شەش كەس لەكوفە دەژیان كەبۆچوونیان هاوشێوەی بۆهلوول بوو. مەبەستی پەیوەست بوون بەویان كرد. بەلآم لەسەریفین كوژران. بۆهلوول كیسە زێرەكەی دەرهێنا و وتی: كێ ئەوانی كوشت تا ئەم كیسە زێرەی پێببەخشم. وتیان ئێمە ئەو كاردمان كردووە چوونكە گومانیان دەكرد لەنێردراوانی خالیدە. بۆهلوول بەدێهاتیەكانی وت: ڕاست دەكەن؟ وتیان: بەڵێ. ئەوانی كوشت و كاری بەدێهاتییەكان نەبوو.

خالیدیان ئاگادار كردەوە كەلەشكرەكەی لەبەرابەر خەواریج شكستیان خواردوە و خەواریج لەسەریفین كوشتاریان خستۆتەگەر. ئەفسەری شەیبانی لەمناڵەكانی حەوەشب كوڕی یەزید كوڕی رومیمی ڕەوانە كرد كە لەنێوان موسڵ و كوفە روبەرووی یەك بوونەوە. كارگوزاری موسڵ، نامەی بۆ هوشام كوڕی عەبدولمەلیك نووسی و ئاگاداری كردەوە و داوای هاوكاری كرد. هوشام نووسی: كوسارە كوڕی بێشر بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە بكە. هوشام ئەوی تەنیا بەبۆهلوول دەناسی. كارگوزار وتی: ئاژاوەچییەكە، كوسارە كوڕی بێشر ناسراو بە بۆهلوولە. بۆهلوول بەهاوەلآنی وت: سوێند بەخوا ناتوانین زادەی ئەم ژنە مەسیحیە ((خالید)) بكوژین. بۆ بەدوای ئەو كەسەدا نەگەڕێین كەتاجی خستەسەر. بەرێكەوت و مەبەستی كوشتنی هوشامی لەشام كرد. كارگوزارانی هوشام ترسان لەوەی ڕێگە بدەن بۆهلوول لەسەرزەمینەكەیانەوە تێپەڕێت. خالید سوپایەكی لەعێراقەوە ڕەوانە كرد. كارگوزاری جەزیرە لەشكرێك و هوشامیش سوپایەكی لەشامەوە نارد. لەخانەقایەك لەنێوان موسڵ و جەزیرە كۆبوونەوە. بۆهلوول رووی كردە ئەوان. دەستەیەك دەڵێن: لەكوحەیل، لەنزیكی موسڵ رووبەرووی یەك بوونەوە. بۆهلوول لەخانەقاكە دابەزی و حەفتا پیاو هاورێیەتیان دەكرد. هێرشی كردەسەر ئەوان و دەستەیەكی لەوان كوشت و سەراسەری ئەو ڕۆژەی بەشەڕ كردن بەسەر برد. ژمارەی سوپاكەی ئەوان بیست هەزار كەس بوو. بریندار و كوژراو لەناو ئەوان زیادی كرد. بۆهلوول و هاورێكانی دابەزین و چوارپێكانی خۆیان كوشت و شەڕێكی قورسیان دەستپێكرد. ژمارەیەكی زۆر لەهاوەلآنی بۆهلول كوژران. بۆهلوول زەربەیەكی بەركەوت و كەوتە سەرزەوی. هاوەلآنی پێیان وت: كەسێك وەك ڕێبەری ئێمە دەستنیشان بكە. وتی:

ئەی خەڵکینە، دیعامە شەیبانی سەروەری باوەڕدانە و ئەگەر ئەویش مرد، یەشکری ڕێبەری ئێوەیە. بۆهلوول هەمان شەو مرد. کاتێك بەیانی داهات، دیعامە ئەوانی بەجێهێشت و هەڵات. زوحاك کوڕی قەیس سەبارەت بەمەرگی بۆهلول دەڵێت:

| | |
|---|---|
| بدلت بعد ابی بشر و صحبته | قوما علی من الاحزاب اعوانا |
| کانهم لم یکونوا من صحابتنا | و لم یکونوا لنا بالامس خلانا |
| یا عین اذری دموعا منك تهتانا | و ابکی لنا صحبة بانوا و اخوانا |
| خلوا لنا ظاهر الدنیا و باطنا | و اصبحوا فی حنان الخلد جیرانا |

یانی: لەجیاتی باوکی بیشر و هاونشینی کردنی ئەو، پیاوێکیان لەدەستەیەکی خراپەکار هێنایە لای من کە لەگەڵ یەك بۆ زیان گەیاندن بەمن یەکیان گرت. وەك بڵێی ئەوان دوێنێ، هاوڕێم نەبوون و پێرێ بەبرای من لەقەڵەم نەدەدران. ئەی چاو، فەرمێسکی بەردەوام ببارێنە و بۆ ئەو هاوڕێ و برایانە بگری کەدوێنێ لەئێمە جیابوونەوە و درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا. ناوەوە ودەرەوەی ئەم جیهانەیان بەئێمە سپارد و خۆیان لەبەهەشتی هەمیشەیی نیشتەجێ بوون.

کاتێك بۆهلوول کوژرا، عەمرۆ یەشکری ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و زۆری نەخایاند، ئەویشان کوشت و لەناویان برد.

## شۆڕشی بەختەری

بەختەری کەناوی خواوەندی خۆڵەمێشە ((ناونیشانەکەی ئەوە بوو)) لەگەڵ شەست پیاوی شەڕکەر دژی خالید شۆڕشی دەستپێکرد. خالید، سیمت کوڕی موسلیمی بەجلی لەگەڵ چوارهەزار شەڕکەر، بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد کە لەپانتاییەکانی فورات ڕووبەرووی یەك بوونەوە و خەواریج شکستیان خوارد و کۆیلە و بێ سەروپێکان ئەوانیان بەردباران و کوشتار کرد.

## شۆڕشی سەختیانی

دواتر وەزیری سەختیانی لەگەڵ چەند کەس لەحیرە ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد. لەهەر گوندێك کەتێدەپەڕی، دەیسوتاند و هەرکەسێکی دەبینی، سەری دەبڕی. دەستی بەسەر

ئەو سەرزەمینە وگەنجینەکانیدا گرت. خالید سوپایەکی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد کەهەموو هاوڕێکانیان کوشتار کرد. خۆی بریندار و بردیانە لای خالید. سەرەتا ئامۆژگاری خالیدی کرد. خالید وتەکانی ئەوی پەسەند و دەستی لەکوشتنی ئەو هەڵگرت و ئەوی خستە زیندانەوە. شەوانە ئەوی لەزیندان دەردەهێنا و گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد. ئەم هەواڵەیان بەهوشام راگەیاند و وتیان: پیاوێکی حەروری کردۆتە هاودەمی خۆی کەخەڵکانی کوشتووە و چەندین گوندی سوتاندووە و سامانی خەڵکانی تالان کردووە. هوشام تورە بوو و نامەی بۆ نووسی و فەرمانی کوشتنی ئەوی پێدا. خالید دەیوت: من ئەو بەبەهادارتر لەکوشتن دەزانم. کوشتنی ئەوی دواخست. هوشام بۆ دووەمین جار نامەی بۆ نووسی و سەرکۆنەی کرد و فەرمانی کوشتن و سوتاندنی سەختیانی دەرکرد. ئەویان لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە سوتاند و ئاگریان تێبەردان. تا کاتی گیاندان قورئانی دەخوێندەوە. لەدوایین ساتەکان ئەم ئایەی خوێندەوە: بڵێ ئاگری جەهەننەم سوتێنەرترە، ئەگەر ئاگادار بن لێی ((توبە/٩/٨١)).

### شۆڕشی سەحاری کوڕی شەبیب

لەم ساڵەدا سەحاری کوڕی شەبیب کوڕی یەزید لەپانتاییەکانی حوبەل ئالای شۆڕشی هەڵکرد. ئەو ڕۆشتبووە لای خالید و پرسیاری نوێژەکانی ئەوی کردبوو. خالید وتبووی: کوڕی شەبیب کاری بەنوێژی من چییە؟ سەحاری بەرێکەوت. خالید پەشیمان بوویەوە و ترسا ئاژاوەیەك بنێتەوە و لەناوی ببات. بەدوایدا گەڕا بەڵام سەحاری نەگەڕایەوە. بەرەو حوبەل بەرێکەوت کەچەند کەس لەبنەماڵەی تیم لات کوڕی سەعلەبە لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد. لەچۆنیەتی بارودۆخ ئەوانی ئاگادار کردەوە. وتیان: لەم زادەی ژنی مەسیحیە چاوەڕوانی چیت؟ باشتر بوو بەشمشێر دەرۆشتیتە سەردانی و دەتکوشت. وتی: سوێند بەخوا مەبەستی پرسیار کردنم لەنوێژی ئەو نەبوو بەڵکو دەمویست دەستم پێی بگات و من بەنائاشنا بزانێت و دواتر ئەو لەتاوانی خوێنی فلان کەس بکوژم. ئەم فلان کەسە لەشەرکەرانی سوفرا ئایین بوو کەخالید ئەوی بەدەم ئەشکەنجەوە کوشتبوو. کوڕی شەبیب پێشنیاری شۆڕشی پێکردن. سی و چەند کەس شوێنی کەوتن و هاوڕێ لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. ئەم هەواڵە بەخالید گەیشت، وتی: لەمە دەترسام. خالید سوپایەکی بۆ

ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. ئەویان لەپانتاییەکانی مونازێر گرت. کوڕی شەبیب شەڕێکی قورسی لەگەڵ ئەوان کرد و دواتر خۆی و هەموو هاوڕێکانی کوژران.

## شەڕی ئەسەد لەگەڵ خوتەلان

لەم ساڵەدا ئەسەد بۆ شەڕی خوتەلان بەڕێکەوت. موسعەب کوڕی عەمرۆ خوزاعی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. موسعەب بەڕێکەوت و لەنزیکی بەدر تەرخان دابەزی. بەدر تەرخان داوای ئەمانی کرد تا بڕواتە لای ئەسەد. موسعەب ئەمانی پێبەخشی وبۆ لای ئەسەد ڕەوانەی کرد. داوای لەئەسەد کرد بەهەزار هەزار درەم ڕازی ببێت. ئەسەد ڕازی نەبوو و وتی: تۆ ڕۆشتیتە ئەو سەرزەمینە و پیاوێکی نەناسراو بوویت، بەهەمان شێوە ئەو سەرزەمینە چۆڵ بکە. بەدر تەرخانیش وتی: تۆیش سوار لەسەر دە ئێستر هاتیتە ناو خوراسان و ئەگەر بڕۆیتەدەر، پێنسەد وشتر ناتوانن بار و بنە وکەل و پەلەکانی تۆ بگوازنەوە. گەنج بووم کاتێك ڕۆشتمە ناو خوتەلان، گەنجی بۆ من بگەڕێنەرەوە.

ئەسەد تووڕە بوو وئەوی بۆلای موسعەب ڕەوانە کرد تا ڕێگەی پێبدات بڕواتە ناو قەڵاکەی خۆی. بەدر تەرخان لەگەڵ کۆیلەکەی ئەسەد گەیشتە لای موسعەب. سەلمە کوڕی عوبەیدالله لەموالیەکان ئەوی گرت و وتی: فەرماندار لەئازاد کردنی پەشیمان دەبێتەوە. ئەوی لای خۆی زیندانی کرد.

ئەسەد لەگەڵ خەڵکان هات و بەموجەشەر کوڕی موزاحیمی وت: چۆنیت؟. وتی: دوێنێ باشتر لەمرۆ بووم. بەدر تەرخان لەدەستی ئێمەدا بوو و پێشنیاری گرانبەهای بەئێمە کرد. فەرماندار، نەبەپێشنیارەکانی ڕازی بوو نەدەستی ئەوی بەستەوە، بەڵکو ئازادی کرد و فەرمانی پێدا بۆ ناو قەڵاکەی خۆی بگەڕێتەوە. لەمکاتەدا ئەسەد لەکردەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە وکەسی بۆ لای موسعەب ڕەوانە کرد و پرسی: ئایا بەدرتەرخان گەڕاوەتەوە بۆ ناو قەڵاکەی خۆی یا نە؟ نێردراو هات و ئەوی لای سەلمە کوڕی عوبەیدالله بینی. ئەوی گرت و بردی بۆ لای ئەسەد کەفەرمانیدا و دەستیان بڕییەوە. ئەسەد وتی: چ کەسێك لەخاوەنەکانی خوێنی باوکی فودەیك، لێرەیە؟ باوکی فودەیك بەدەستی بەدرتەرخان کوژرا بوو. پیاوێکی ئەزدی هەستا و وتی: من. ئەسەد وتی: بیکوژە. ئەو کارەی کرد. ئەسەد دەستی بەسەر مەهین قەڵادا گرت و قەڵایەکی

بچوك مایەوە كەژنان و سامانەكەی بەدرتەرخان لەوێ بوو. ئەسەد نەیتوانی دەست بەسەر ئەو قەلآیەدا بگرێت. ئەو سوپاكەی خۆی لەناو دۆڵەكانی خوتەلان بلآو كردەوە كەبەدەستی پڕ لەئەسیر و تالآنییەكان گەڕانەوە. كەسان و بنەماڵەكەی بەدرتەرخان بۆ چین هەلآتن.

## بیركردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا وەلید كوڕی قەعقاع لەسەرزەمینی رۆمییەكان شەڕی كرد.

باوكی شاكر مەسلەمە كوڕی هوشام كوڕی عەبدولەلیك، لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا و كوڕی شەهابی زوهری هاورێیەتی دەكرد. كارگوزاری مەدینە و مەككە و تایف، محەممەد كوڕی هوشامی مەخزومی بوو. عێراق و سەراسەری رۆژهەلآت لەژێردەستی خالید كوڕی عەبدواللەی قەسیریدا بوو و براكەی لەخوراسان فەرمانڕەوایەتی دەكرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەسەد لەم ساڵەدا مردبوو و جەعفەر كوڕی حەنزەلەی بەهرانی لەجێگەی ئەو كاروبارەكانی رادەپەڕاند. دەستەیەك دەڵێن: ئەسەد لەساڵی ١٢٠/ ٧٣٨ زایینی لەناوچوو كە بەخواستی خواوەندی گەورە لەكاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

هەروەها لەم ساڵەدا مەروان كوڕی محەممەد لەئەرمەنستان شەڕی كرد و رۆشتە قولآیی سەرزەمینەكانی لان و لەوێوە گەیشتە سەرزەمینی خەزەرەكان و لای بەلەنجەر و سەمەندەر تێپەڕی و لەبەیزا دابەزی كەخاقان لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد و لەبەرابەر مەروان هەلآت.

ئەم كەسانە لەم ساڵەدا مردن: حەبیب كوڕی باوكی سابت، عەبدولرەحمان كوڕی سەعید كوڕی یەربووعی مەخزومی، قەیس كوڕی سەعدی مەككی، سلێمان كوڕی موسا ئەشدەق و ئەیاس كوڕی مەسلەمەی ئەكوەع.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیستی کۆچی ( ٧٣٨ زایینی )

### مردنی ئەسەد کوڕی عەبدوڵڵە

لەم ساڵەدا، لەمانگی ڕەبیع الاول/ مارسی ٧٣٨ زایینی، ئەسەد کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری لەشاری بەڵخ مرد.

هۆکاری مردنەکەی ئەوە بوو دومەڵێکی گەورە لەسکی هات و لەزیانەکەی نەخۆش کەوت. دواتر چاکبوویەوە. ڕۆژێك ڕۆشتەدەر وپێش خواردن، هەرمێیان بۆ هێنا. ئەوانی یەك یەك هەڵگرت و لەناو خەڵکدا دابەشی کرد. هەرمێیەکی هەڵگرت و بۆ ((خوراسان)) فەرمانداری هەراتی هاویشت. دومەڵەکەی دەمی کردەوە و لەناوچوو. جەعفەر کوڕی حەنزەلەی بەهرانی لەجیاتی ئەو هاتە سەرکار و بۆ ماوەی چوار مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد و دواتر لەمانگی ڕەجەب/ ژوئیەی ٧٣٨ زایینی، فەرمانی فەرمانداری نەسر کوڕی سەیار گەیشت.

خوراسان، فەرمانداری هەرات، لەگەسە نزیکەکانی ئەسەد بوو. لەجەژنی مێهرگان، بەدیاری و خەڵاتی فراوان و گرانبایی ڕۆشتە لای ئەسەد کەهیچ کەس هاوشێوەی دیارییەکانی ئەوی نەهێنابوو. بەهای دیارییەکان هەزاران هەزار (؟) بوو. بەئەسەدی وت: ئێمەی ئێرانی بۆ ماوەی چوارسەد ساڵ بەختەوەرانە پاشایەتیمان کرد و لەرێگەی فرەزانی و بیرمەندی و خۆراگرییەوە ئەم پێگەیەمان بەدەست هێنا. خەڵکان لەناو ئێمە سێ دەستە بوون: پیاوێکی ڕووگەش و دەم بەبزە کەبۆ هەر شوێنێك دەرۆشت، خواوەند دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆی بۆ دەکردەوە، دوای ئەو لەپێگەدا، کەسێك دەهات کەجوامێرییەکەی لەبنەماڵەیەك، بەبەرزترین پلەی خۆی گەیشتبوو. هەرکەس بەمشێوە بێت، بەخێرهاتنی دەکەن و سڵاوی بۆ دەنێرن. سێیەم دەستە خەڵکانێکی بەخشندە و دڵفراوان بوون. هەرکەس بەمشێوەبێت، دەیانکردە ڕێبەری خۆیان و لەپێشی پێدەبەخشن. خواوەند کرداری ئەم سێ دەستەی لەتۆدا کۆکردۆتەوە و ئێمەکەس ناناسین لەتۆ بۆ کوێخایەتی شیاوتر بێت. تۆ پیاوێکی ڕێزدار و پارێزەری بنەماڵە و کەسانی نزیکی خۆتیت و لەناو ئەوان کەس ناتوانێت ستەم لەگەورە یا بچوکێك بکات. تۆ

لەدمشتە کاکی بەکاکییەکان باشترین کاروان سەراکانت دروست کرد. یەکێك لەپێ پیرۆزییەکانی تۆ ئەوە بوو کە، ڕووبەڕووی خاقان بوویتەوە لەکاتێکدا سەد هەزار پیاوی شمشێرودشێن و حارس کوڕی سورمیح هاورێیەتیان دەکرد. شکستت پێهێنا و بۆ هەڵاتن ناچارو سوپاکەیت کوشتار و لەشکرگەکەیت تالان کرد. بەخشندەیی و دڵفراوانی تۆ بەوشێوەیە کەئێمە نایزانین، زیاتر کام سامانە پەسەند دەکەیت: ئەوەی بەدەستی دێنیت یا ئەوەی لەدەستت دەڕوات، بەڵام تۆ ئەوەی لەدەستت دەڕوات، زیاتر پەسەند دەکەیت. ئەسەد پێکەنی و وتی: تۆ باشترین فەرمانداری ئێمەیت. هەموو دیارییەکانی لەناو هاوەڵانی خۆی دابەش کرد. کاتێك مرد، عەبدی لەپرسەی ئەودا ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

نعی اسد بن عەبدواللة ناع — فریع القلب للملك المطاع

ببلخ وافق المقدار یسری — و ما لقضاء ربك من دفاع

فجودی عین بالعبرات سحا — الم یحزنك تفریق الجماع

یانی: کەسێك هەواڵی مەرگی ئەسەدی بۆ ئێمە هێنا. دڵ لەداغی مەرگی پاشای بەختەوەر ژانی گرت. لەبەڵخ فەرمانی خواوەند، پێش من کەوتەوە چوونکە بەرگری لەبەرابەر فەرمانی خواوەند ناکرێت. ئەی چاوی من، لەپرسەی ئەودا بارانی فرمێسك ببارێنە، ئایا پچڕانی دەستەکان، تۆی خەمبار نەکرد؟

ئەم قەسیدەیە چەندین بەیتی دورودرێژە. کاتێك ئەسەد مرد، باوکی شاکر مەسلەمە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولەلیك، بۆ خالیدی قەسری نووسی:

اراح من خالد فاهلکە — رب اراح العباد من اسد

اما ابووە فکان مۆتشبا — عبدا لئیما لاعبد فقد

بری الزنی و الصلیب و الخمر — و الخنزیر حلا و الغی کالرشد

و امە همها و بغیتها — هو الاماء العواهر الشرد

کافرة بالنبی مؤمنة — بقسها و الصلیب و العمد

یانی: خواوەند، ئێمە لەخالید ئاسوودە بکات، ئەو خوایەی زیانی ئەسەدی لەئێمە دوور کردەوە. باوکی پیاوێکی چەند ڕەگە بوو، کۆیلەیەکی کەم بەها بۆ کۆیلەکان بوو، تەنیا ئەمە و هیچیتر. بەخشینی بێ جێ، خاچ، شەراب و گۆشتی بەراز ڕەوا دەکات و

گومڕایی شان بەشانی رزگاری. کار و مەبەستی دایکی ئەوە بوو کەکەنیزە رووسپیەکان ئەنجامی دەدەن. باوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) نییە و بەقەشە و شۆرینی جەستە لەکاتی منالێدا ((تعمید)) و خاچ پەرەستی پێبەندە.

مەبەستی لە(عمد)) هەمان معمودیە یە. کاتێك خالید نامەکەی خوێندەوە، وتی: ئەی بەندەکانی خوا، فریام کەون! کێ بینیویەتی پیاوێك بۆ مەرگی براکەی بەمشێوەیە دڵنەوایی بکەن؟ لەنێوان خالید و باوکی شاکر دوژمنایەتی لەئارادابوو. هۆکارەکەی ئەوەبوو کەهوشام مەبەستی ئەوەی کرد کوڕەکەی باوکی شاکر (مەسلەمە) وەك خەلیفە دەستنیشان بکات.

کومەیت وتی:

ان الخلافة كائن اوتادها          بعد الوليد الى ابن ام حكيم

یانی: بزمارەکانی خێوەتی خەلافەت، دوای وەلید، لەسەر خێوەتەکەی کوڕی دایکی حەکیم دادەکوترێت.

مەبەستی باوکی شاکر بوو کەدایکی ناوی دایکی حەکیمە. ئەم هۆنراوە بەگوێی خالید گەیشت، وتی: من بەهەر خەلیفەیەك نازناوەکەی باوکی شاکر بێت، ناباوەڕم. باوکی شاکر ئەمەی بیست و ڕقی خالیدی لەدڵ گرت.

## کارەکانی شوێنکەوتەکانی بەنی عەباس لەخوراسان

(لەسەر کار لابردنی خیداشی خورەمی)

لەم ساڵەدا شوێنکەوتەکانی بەنی عەباس لەخوراسان، سلێمان کوڕی کەسیریان بۆ لای محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس ڕەوانە کرد تا لەبارودۆخی خۆیان ئاگاداری بکەنەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوەبوو کەمحەممەد چیتر نامەی بۆ ئەوان نەدەنارد. لەبەر ئەوەی شوێن خیداش کەوتن کەئاماژەمان پێدا و ئەوان هەواڵی درۆیینەیان بۆ محەممەد ڕەوانە دەکرد. کاتێك نێردراوان و نامەکانی ئەو، درەنگ کەوتن، سلێمانیان ڕەوانە کرد تا لەچۆنیەتی بارودۆخ ئاگادار ببێتەوە. سلێمان ڕۆشتە لای محەممەد و محەممەد لەبەر شوێنکەوتنی خیداش بەتوندی هەڵس وکەوتی لەگەڵ کرد. سلێمانی بەنامەیەکی

سەرمۆرکراو بۆ خوراسان گەڕاندەوە. مۆرەکەیان کردەوە و بینیان تەنیا نووسراوە: بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان. ئەم کارەیان بەلاوە گرنگ بوو و زانیان کردارەکانی خیداش بۆتە هۆی نارەزامەندی ئەو. محەممەد کوڕی عەلی بەدوای گەڕانەوەی سلێمان کوڕی کەسیر، بووکەیر کوڕی ماهانی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد و نامەیەکی نووسی و ئاگاداری کردنەوە کەخیداش درۆزنە. بەراستگۆی نەزانن و ریسوایی بکەن. بووکەیر بۆ لای محەممەد گەڕایەوە کەبەودا چەندین داردەستی کانزایی، بۆ ڕەوانە کردن، هەندێکیان مسین بوون. بووکەیر، گەورەکان و شوێنکەوتەکانی کۆکردەوە و بەهەرکام، داردەستێکیدا. زانیان کرداریان لەگەڵ مەبەستەکەی ئەو ناسازگارە. تۆبەیان کرد و دەستیان لەکارە سەرکۆنەکراوەکانی خۆیان هەڵگرت.

## لەسەر کار لابردنی خالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسریو فەرمانداری یوسف کوڕی عومەری سەقەفی

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، خالیدی لەهەموو کار و ئەرکەکانی دوورخستەوە. سەبارەت بەهۆکاری لەسەر کار لابردنی خالید، بۆچوونەکان جیاوازن.

دەڵێن: باوکی موسەنا فروخ، سەرپەرەستی زەوی و بێستان و مەڕوماڵاتەکەی هوشام لەپانتاییەکانی روباری ئەنار ژیانی بەسەر دەبرد. بوونی ئەو بۆ خالید دژوار بوو. لەبەر ئەمە خالید بەحەییانی نەبتی وت: برۆ لای هوشام و بەخششەکانی فروخ زیاد بکە. حەییان ئەو کارەی کرد و سەرپەرەستی سامانەکانی هوشامی گرتەدەست. بەلام بوونی حەییان بۆ خالید لەفروخ دژوارتر بوو. دەستی بەڕەنجاندنی ئەو کرد. حەییان بەردەوام دەیوت: مەمرەنجێنە چوونکە دەستپەروەردەی خۆتم. بەلام خالید لەسەر ڕەنجاندنی ئەو بەردەوام بوو. کاتێك ڕۆشتە لای ئەو، زەوییە کشتوکاڵیەکانی هوشامی وێران کرد و دواتر ڕۆشتە سەردانی هوشام و وتی: خالید زەویە کشتوکاڵیەکانی تۆی لەناو بردووە. هوشام کەسی ڕەوانە کرد تا لێپرسینەوە لەم کارە بکات. حەییان بەنۆکەرێك لەنۆکەرەکانی خۆی وت: ئەگەر قسەیەك بکەیت بەو شێوەی کەدڵخوازی منە و هوشام بیبیستێتەوە، هەزار دینارت پێدەبەخشم. وتی: دینارەکان بێنە و هەرچیت پێخۆش بێت، دەیهێنمە سەرزمان. هەزار دیناری پێبەخشی و پێی وت: منالێك لەمنالەکانی هوشام بگرێنە و کاتێك دەستی

بەگریان کرد، بەسەریدا بقیژێنە: بێدەنگ بە! نۆکەر ئەو کارەی کرد و هوشام بیستی و لەحەییان سەبارەت بەداهاتی خالید پرسیاری کرد. حەییان وتی: سیانزە هەزار هەزارە. ئەم کارە بۆ هوشام ناپەسەند و دژوار بوو.

دەستەیەك دەڵێن: داهاتەکەی بیست هەزار بوو. ئەو چەندین روباری لەعێراق هەڵکەند کەبریتی بوون لە: روباری خالید، باجەری، تارمانا، خوجەستە، (پیرۆز) گشتی، شاری شاپوور و ئاشتی. چەندین جار لەویان بیست کەدەیوت: من ستەم لێکراوم، هیچ لەژێر پێمدا نییە مەگەر ئەوەی هی خۆمە. مەبەستی ئەوە بوو کەعومەر کوڕی خەتاب یەك لەسەر چواری سوادی تایبەت کردووە بە بووجەیلە.

عوریان کوڕی هەیسەم و بیلال کوڕی ئەبی بووردە رێنوێنیان کرد تا سامانەکانی خۆی بەهوشام پێشنیار بکات تا ئەوەی دەخوازێت، هەڵیبگرێت. ئەوسا ئەم دووانە بەڵێن دەدەن رەزامەندی هوشامی بۆ بەدەست بێنن چوونکە بیستبوویان کەهوشام لێی نارازی و تورەیە. خالید رازی نەبوو و وەڵامی ئەم دووانەی نەدایەوە. دەڵێن: هوشامیان ئاگادار کردەوە کەخالید بەکوڕەکەی خۆی وتووە: تۆ کەمتر لەمەسلەمە کوڕی هوشام نیت.

دووبارە پیاوێك لەبنەماڵەی عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاص لەیەکێك لەکۆبوونەوەکان رۆشتە لای خالید. خالید بەتوندی قسەی لەگەڵ کرد. ئەو نامەی بۆ هوشام نووسی و لەدەست خالید، سکالای کرد. هوشام نامەی بۆ خالید نووسی و سەرکۆنەی کرد و جوێنی پێدا و فەرمانی پێدا بەپێ بڕواتە دەرگای ئەو پیاوە و دڵنەوایی بکاتەوە چوونکە مانەوە یا لەسەر کارلابرانی تۆ، بەدەستی ئەوە. خالید هەندێ کات ناوی هوشامی دەهێنایە سەرزمان و بەزادەی ژنی نەزان ناوی دەبرد. خالید لەسەر تەختی وتاردان، دادەنیشت و دەیوت: ئێوە گومان دەکەن من بەهای شتەکانم زیاد کردووە، نفرین و نەحلەتی خواوەند، لەو کەسە بێت کەئەو کارەی کردووە.

هوشام نامەی بۆ نووسی و وتی: دانەوێڵە نەفرۆشیت تا ئەو کاتەی دانەوێڵەی سەروەری باوەڕداران کۆتایی پێدێت. بەهای پەیمانەیەك دانەوێڵە بۆ چەندین دردەم بەرز بوویەوە. خالید بەکوڕەکەی دەوت: کاتێك سەروەری باوەڕداران نیازی بەتۆ بێت، چۆن دەبیت!

ئەم وتانە بەهوشام دەگەیشت و دڵی ئەوی پیس کرد. دووبارە ئاگاداریان کردەوە کە:

ئەو فەرمانداری عیراق تایبەت بەئیمپراتۆری ئومەوییەکان دەزانێت و ریسوای دەکات. هوشام نامەی بۆ نووسی و وتی: ئەی زادەی دایکی خالید، بیستومە دەڵێیت، فەرمانداری عێراق، هۆکارێك نییە بۆ سەرفەرازی تۆ، ئەی زادەی ژنی بۆگەن! چۆن فەرمانداری عێراق نابێتە هۆکاری سەرفەرازی تۆ لەگەڵ ئەوەی لەخەڵکانی کەم بەها و ریسواییت. سوێند بەخوا، گومان دەکەم، کاتێك یەکەم منالّ لەقورەیشیەکان بێتە لای تۆ، دەستەکانت بەملتەوە دەبەستێتەوە.

بەردەوام ئەم هەواڵانە بەهوشام دەگەیشت و زیاتر دەبووە هۆی تورە بوون و بێزار بوونی. بریاریدا لەسەر کار لایبات. ئەم بڕیارەی لەدڵی خۆیدا هێشتەوە و نامەی بۆ یوسف کوڕی عومەری سەقەفی (فەرمانداری یەمەن)) نووسی کەلەگەڵ چەند کەسێك لەهاورێکانی خۆی بڕواتە عێراق چوونکە ئەوی وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە دەستنیشان کردووە. یوسف بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەنزیك ئەو شارە دابەزی تا ڕەنج و شەکەتی رێگا لەجەستەی دەربکات. تارق جێگری خالید لەکوفە، کورەکەی خەتێنە کردبوو و زیاد لەسامان و داراییەکان و جل و بەرگە گرانباییەکان، هەزاران کەنیز و کۆیلەی وەك دیاری بۆ بردبوو. لەم کاتەدا کەسانێك لەعێراقیەکان لای یوسف تێپەڕین و لێیان پرسی: کێیت و چیت دەوێت؟ وتیان: مەبەستی شوێنێکمان هەیە. ڕۆشتنە لای تارق و ئاگاداریان کردەوە و فەرمانیان پێدا بیانکوژێت چوونکە لەخەواریجن. یوسف بۆ ناو ماڵەکانی سەقیف بەرێکەوت کەپێیان وت: کێیت؟ یوسف کاری ئەوانی بەنهێنی هێشتەوە و فەرمانی پێدان موزەریەکان لەوێ کۆبکەنەوە. کاتێك کۆبوونەوە، لەکاتی بەرەبەیان، ڕۆشتە ناو مزگەوت و فەرمانی بەبانگدەردا و نوێژی خوێند. چەند کەسێکی بەدوای خالید و تارق ڕەوانە کرد و ئەم دووانەی گرت. قازانەکان هێشتا دەکوڵان بۆ ئامادە کردنی نانی بەیانی.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك هوشام مەبەستی ئەوەی کرد یوسف کوڕی عومەر بکاتە فەرمانڕەوای عێراق، ئەم مەبەستەی لەدڵی خۆیدا هێشتەوە. جوندەب کۆیلەی یوسف نامەکەی بۆهوشام برد، خوێندیەوە و بەسالم کوڕی عەنبەسە سەرپەرستی دەبیرخانەی وت: بەنوێنەرایەتی من وەڵامی ئەم نامەیە بدەرەوە و نامەکە بێنە لای من. هوشام بەخەتی خۆی چەند دێرێکی بۆ یوسف نووسی و فەرمانی پێدا بەرەو عێراق

بەرێکەوێت. سالم نامەکەی نووسی و بردی بۆ هوشام. هوشام نامەکەی خۆی خستە ناو نامەکە و مۆری لێدا. دواتر نێردراوی یوسفی بانگ کرد. فەرمانیدا ئەشکەنجەی بکەن و جل و بەرگەکانی بدڕێنن. نامەکەی پێدا و بەرێکەوت. بەشیر کوڕی ئەبی تەلحە کەجێگری سالم بوو، گومانی لا دروست بوو و وتی: ئەمە، فێڵە. ئەو یوسفی وەك فەرمانڕەوای عێراق دەستنیشان کردووە. بۆ عەییاز، جێگری سالم لەعێراق نامەی نووسی: بنەماڵەکەت جل و بەرگی چنراوی یەمەنیان بۆ ناردوویت. کاتێك بەدەستت گەیشت، لەبەری بکە و سپاسی خواوەند بکە وتارق ئاگادار بکەرەوە. عەییاز تارق کوڕی ئەبی زیادی لەناوەرۆکی نامەکە ئاگادار کردەوە.

بەشیر لەنامەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و بۆ عەییازی نووسی: کەسەکانت بۆچوونی خۆیان گۆڕیوە، بەباشیان زانی جل و بەرگەکان لای خۆیان بپارێزن. عەییاز نامەی دووەمی بردە لای تارق. تارق ووتی: هەواڵی راست لەنامەی یەکەمدایە بەڵام بەشیر لەکردەکەی خۆی پەشیمان بۆتەوە و ترساوە ئەم کارە ئاشکرا ببێت.

تارق لەکوفەوە بۆ لای خالید بەرێکەوت کە لەواست دەژیا. داوودی بەریدی کەسەرپەرەستی پاسەوانەکان و دەبیرخانەی خالید بوو، ئەوی بینی و خالیدی ئاگادار کردەوە. مۆڵەتیان پێدا. کاتێك ئەوی بینی، وتی: بۆ بێ فەرمانی من هاتوویت؟ وتی: کارێك پێشهاتووە و گومانم لا دروست بووە. نامەم بۆ فەرماندار نووسی و بۆ مەرگی براکەی دڵنەواییم کرد، شیاو بوو بەپێ بڕۆمە لای. خالید دڵی بۆی سووتا و فەرمێسکی لەچاوان باراند. وتی: بۆ سەر کارەکەت بگەڕێرەوە. کاتێك داوود دوورکەوتەوە، لەهەواڵەکان ئاگاداری کردەوە. وتی: چارە چییە؟ وتی سواربە وبڕۆ لای سەرۆەری باوەڕداران و لەو هەواڵانەی بەرگوێ کەوتووە، داوای بەخشین و لێخۆش بوون بکە. وتی: بێ فەرمانی ئەو ئەم کارە ناکەم. وتی: من ڕەوانە بکە تا مۆڵەتی ئەو کارەت بۆ وەربگرم. وتی: ئەمەیش پەسەند ناکەم. وتی: بڕۆ لای سەرۆەری باوەڕداران و بەڵێنی پێبدە، ئەوەی لەم ساڵانەدا کەم هاتووە، بۆ ئەو دەگەڕێنیتەوە. من مۆڵەتی ئەو کارەت بۆ دێنم. وتی: ئەندازەکەی چەندە؟ وتی: سەد هەزار هەزار. وتی: لەکوێ بیهێنم؟ سوێند بەخوا دەهەزار هەزارم بۆ کۆ ناکرێتەوە. وتی: من و فلانە کەس و فیسارە کەس بۆت کۆدەکەینەوە. وتی: کەسێکی ریسوام ئەگەر شتێك بەوان ببەخشم و دواتر لێیان وەربگرمەوە. وتی:

دەتپارێزین و بەسامانی خۆمان بەهێزت دەکەین و ئەوسا ژیانی جیهان سەر لەنوێ دەستپێدەکەینەوە. سەرچاوەی داراییەکان بۆ تۆ هەڵدەقوڵێت وبۆ ئێمە دەمێنێتەوە. ئەمە باشترە لەوەی کەسێك بێت و داوای ئەم سامانەمان لێبکات. سامانەکان لای خەڵکی کوفەیە کەساتەکان دەبژێرن. ئێمە دەکوژرێین و ئەوان سامانەکان دەخۆن. خالید رازی نەبوو. تارق ماڵئاوایی لێکرد و گریا و وتی: ئەم دوایین جارە لەم جیهانە چاومان بەیەك دەکەوێت. بۆ کوفە گەڕایەوە و خالید بۆ جەممە.

نێردراوی یوسف گەیشتە یەمەن و ڕۆشتە لای و وتی: سەروەری باوەڕداران تورەییە و ئەشکەنجەی دام و وەڵامی نامەکەی تۆی نەدایەوە. ئەمە نامەی سالم سەرپەرەستی دەبیرخانەیە.

نامەکەی وەرگرت و کاتێك خوێندیەوە، نامەکەی هوشامی بەدەستخەتی خۆی بینی کەئەوی وەك فەرمانداری عێراق دەستنیشان و فەرمانی گرتنی زادەی ژنی مەسیحی و کارگوزارەکانی ئەوی پێدابوو. هەروەها نووسیبووی ئەشکەنجەیان بکات تا دڵی ئارام و ئاسوودە ببێت یا ئەوان گیان بێتە سەر لێویان. ئەو رێنیشاندەرێکی هەڵبژارد و هەمان ڕۆژ بەرێکەوت. کوڕەکەی، سەڵتی وەك جێگری خۆی لەیەمەن دەستنیشان کرد. لەمانگی جەمادی الثانی/ ژوئەنی ٧٣٨ زایینی گەیشتە کوفە و لەنەجەف مایەوە و کۆیلەکەی خۆی، کیسانی ڕەوانە کرد و وتی: تارق بۆ لای من بێنە. ئەو سوار کۆپانی کەر بکە و ئەگەر نەهات، بەراکێشان تا ئێرە بیهێنە.

کیسان ڕۆشتە حیرە و عەبدولمەسیح سەروەری خەڵکەکەی لەگەڵ خۆی برد و ڕۆشتە لای تارق. پێی وت: یوسف هاتۆتە عێراق و داوای تۆ دەکات. تارق بەکیسانی وت: ئەگەر فەرماندار سامانی دەوێت، هەرچی بخوازێت، پێی دەدەم. ئەوویان بۆ لای یوسف کوڕی عومەر برد و لەحیرە چاویان بەیەك کەوت. تا توانی ئەشکەنجەی کرد. دەڵێن، پێنسەد قامچی لێدا. ڕۆشتە ناو کوفە و عەتا کوڕی موقەدەمی بەدوای خالید، بۆ جەممە ڕەوانە کرد. نێردراو گەیشتە دەرگای خالید و وتی: ئەی باوکی هەیسەم، مۆڵەت بۆ من وەربگرە. دەرگاوان، ڕەنگ پەڕاو، ڕۆشتە لای خالید. خالید وتی: چی بووە؟ وتی: باشی رووی تێکردووین. خالید وتی: هیچ چاکیەك لەروخساری تۆدا نابینم. وتی: عەتا وتوویەتی لەباوکی هەیسەم بۆ من داوای مۆڵەت بکە. خالید وتی: مۆڵەتی پێبدە. عەتا هاتە ناو و

خالید وتی: هاواری لەدایکی کەتورەییەکەی ئاگرین لەئارادایە. ئەوی گرت و زیندانی کرد. ئەبان کوڕی وەلید و هاوڕێکانی بەنوێنەرایەتی لەو لەسەر بنەمای دانی نۆ هەزار هەزار، پەیمانی ئاشتیان نووسی. بەیوسفیان وت: ئەگەر رازی نەدەبوویت، دەتوانی سەد هەزار هەزار لەو وەربگریت. پەشیمان بوویەوە و وتی: زمانم وەك بارمتە دانا و باوەڕم نییە، بەلاّم لەوتەکانی خۆم پەشیمان نابمەوە.

هاوەلاّنی خالید ئاگاداریان کردەوە. وتی: هەڵەتان کرد. من دڵنیا نیم کەسامانەکە وەربگرێت و دواتر لەوتەکانی خۆی پەشیمان ببێتەوە، بگەڕێنەوە. گەڕانەوە و یوسفیان ئاگادار کردەوە کەخالید رازی نەبووە. وتی: گەڕانەوە؟ وتیان: بەڵێ. وتی: سوێند بەخوا بەدوو بەرابەر و چوار بەرابەری ئەوە رازی نابم. زیاتری وەرگرت. دەستەیەك دەڵێن: سەد هەزاری وەرگرت. یوسف کەسی بەدوای بیلال کوڕی ئەبی بووردە ڕەوانە کرد و ئەوی گرت. بیلال لەکوفە ماڵێکی کڕیبوو بەلاّم هێشتا نەرۆشتبووە ناو ماڵەکە. یوسف ئەوی بەستەوە و بردیە ناو ماڵەکە. دواتر ئەو ماڵە بوو بەبەندیخانە. خالید بەردەوام بەخششی بەهاشمیەکان دەبەخشی و چاکەی لەگەڵ ئەوان دەکرد.

محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەففان ڕۆشتە لای تا لەبەخششەکانی ئەو کەڵك وەربگرێت بەلاّم بەمەبەستەکەی خۆی نەگەیشت. ئەم محەممەدە وتی: بەخششی ئەو تایبەتە بەهاشمیەکان نەك ئێمە جگە لەوەی تەنیا ئیهانە و جوێن بەعەلی کوڕی ئەبی تالب دەدات.

وتەکانی بەگوێی خالید گەیشت، وتی: ئەگەر دەخوازێت، نفرین و سەرکۆنەی عوسمانیش دەکەم.

لەگەڵ ئەمەیشدا، خالید، لەجوێندان و سەرکۆنەکردنی عەلی سنورەکانی دەبەزاند. دەڵێن: ئەم کارەی دەکرد تا نزیك بوونەوی لەهاشمیەکان بشارێتەوە و خۆی لەو خەڵکە نزیك بکاتەوە.

فەرمانداری خالید لەعێراق لەشوالی ١٠٥/ مارسی ٧٢٤ زایینی دەستی پێکرد و لەسەر کار لابرانی لەجەمادی الاول ١٢٠/ مەی ٧٣٨ زایینیدا بوو. کاتێك یوسف کاروبارەکانی عێراقی گرتەدەست، ئیسلام لاواز و کاروباری فەرمانڕەوایەتی کردن لەدەستی ئەمان بەخشراوەکاندا بوو. یەحیا کوڕی نەوفل لەمبارەوە دەڵێت:

اتانا و اهل الشرك اهل زكاتنا    و حكامنا فيما نسر و نجهز

فلما اتانا يوسف الخير اشرقت    له الارض حتى كل واد منور

و حتى راينا العدل غى الناس ظاهرا    و ما كان من قبل العقيلى ظاهر

یانی: فەرماندارەکەمان یوسف کاتێك هاتە سەرکار، کەبتپەرستەکان سەرپەرەستی زەکات وەرگرتنی ئێمە بوون و وەك فەرمانڕەوای ئێمە لەهەموو کاروبارەکان حسێبیان بۆ دەکرا کەدەیشارینەوە یا ئاشکرای دەکەین. کاتێك یوسفی ڕەوشت بەرز هات، زەوی لەو روناك بوویەوە و بارانی رەحمەت هەموو شوێنێکی گرتەوە. دادپەروەری لەناو خەڵکان دەرکەوت بەلاّم پێش پیاوی عەقیلی لەئارادا نەبوو.

ئەم قەسیدە چەندین بەیتی هەیە. دوای ئەوە وتی:

ارانا و الخليفة اذرمانا    مع الاخلاص بالرجل الحديد

كاهل النار حين دعوا اغيثوا    جميعا بالحميم و بالصديد

یانی: ئەو نیشانی ئێمەیدا و خەلیفە((کاتێك دەستی بۆ سەر ئێمە ئاوەلاّ کرد)) پیاوی ئاسنینی بۆ سەرمان نارد. هاوشێوەی جەهەننەمیەکانن کاتێك هاوار دەکەن، ئاوی گەرم و چڵکی کولاّو لەقوڕگیان دێتەدەر.

لەیوسفدا زۆر کردارو عادەتی ناسازگار کۆببوونەوە. نوێژی درێژ دەکردەوە. بەردەوام لەمزگەوتا بوو، نۆکەر و کەسەکانی خۆی لەخەڵکان دوور دەخستەوە، وتاری نەرم بوو، عادەتی پەسەند کراو، بەردەوام نوێژ و پاڕانەوەی بەیانیانی بەجێدەهێنا و لەگەڵ کەس نەدەپەیڤی تا نوێژی نیمەڕۆی دەخوێند. قورئانی دەخوێندەوە و لەدەرگای خوا دەپاڕایەوە. شارەزای کولتور و هۆنراوە عەرەبیەکان بوو. بەو پەڕی توندییەوە سزای دەدا. جلی تازەی دەکڕی و نینۆکی بەسەردا دەکێشا. ئەگەر نینۆکی لەپەت یا دەزوێك گیری دەکرد، خاوەن جلەکانی قامچی باران دەکرد و هەندێ کات دەستی دەبڕییەوە. پیاوێکی نەزان و ئەحمەق بوو. ڕۆژێك جلێیکان بۆ هێنا. بەدەبیرەکەی وت: سەبارەت بەم جلە چی دەڵێیت؟ دەبیر وتی: دەبووا، خانەکانی لەمە بچوکتر دەبوو. بەجۆلاّکەی وت: ئەی زادەی ژنی بۆگەن، راست دەکات. جۆلاّ وتی: ئێمە بۆ ئەم کارە شارەزاترین. یوسف بەدەبیرەکەی وت: ئەی زادەی ژنی بۆگەن، راست دەکات. دەبیر وتی: ئەم پیاوە لەساڵدا تەنیا دوو دەست جل ئامادە دەکات و من هەر ساڵەو سەدان دەست جل، دێتە بەردەستم.

یوسف بەجۆلاکەی وت: ئەی زادەی ژنی بۆگەن، راست دەکات. بەمشێوەیە ساتێك ئەمیان بەدرۆزن و ساتێك ئەوی دیکەیان بەدرۆزن ناو دەبرد تا ئەوەی خانەکانی جلەکەی بژارد وبینی لەلایەکی، یەك خانەی کەمە. لەبەر ئەمە، سەد قامچی لەجۆلاکەدا.

دەڵێن: یوسف مەبەستی سەفەری کرد. کەنیزەکانی خۆی کۆکردەوە و بەیەکێك لەوانی وت: لەگەڵ من دێیت؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەی بەدبەخت، ئەمە لەئارەزووی تۆ بۆ باوەشی پیاو، سەرچاوە دەگرێت. خزمەتکار، بیکوژە. بەیەکی دیکەی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: لای منداڵەکانم دەمێنمەوە. وتی: ئەی بەدبەخت، لەگەڵ من نایێت؟ بەسێیەمی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: نازانم چی بڵێم، وتەی هەرکامیان بڵێم، لەسزای تۆ ئاسودە نابم. یوسف وتی: ئەی بۆگەن، مشتومڕ لەگەڵ من دەکەیت، دارێك بکێشە بەسەریا. لەهەموو کەنیزەکانی دا.

پیاوێك بوو قەڵەو و گۆشتن، جەستەیەکی نارێك و بالآیەکی کورت، ریشێکی درێژ و زمانێك بەدوور لەزانست. جل و بەرگی درێژیان بۆ دەهێنا تا کورتی بکاتەوە و لەبەری بکات. ئەگەر کەسێك دەیوت: درێژە، لێی دەدا، ئەگەر دەیوت: تەواو نییە، مەگەر ئەوەی بەزۆر بیهێنینەوە یەك، شادمان دەبوو. جل و بەرگ یا قوماشی درێژیان بۆ هەڵدەبژارد وئەوەی دەیویست، هەڵیان دەگرت و وایان نیشاندەدا کەقوماشەکە کورت بووە بەلاّم ئەوان توانیویانە جلەکەی بۆ ئامادە بکەن. بەم کارە، شادمان دەبوو. لەمبارەوە چەندین داستانی دیکە لەو دەگێڕنەوە: یەك ئەوەی کە رۆژێك بەدەبیرەکەی وت: بۆ نەهاتوویت؟ وتی: ئازاری ددانم هەبوو. پیاوێکی گەرماوچی بانگ کرد و ددانەکەی بۆ کێشا و لەگەڵ ئەو ددانە، ددانێکی دیکەیشی دەرهێنا.

## فەرمانداری نەسر کوڕی سەیاری کەنانی لەخوراسان

کاتێك ئەسەد کوڕی عەبدوڵڵا، مرد، هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، لەگەڵ عەبدولکەریم کوڕی سەلیتی حەنەفی کەشارەزای کاروباری خوراسان بوو، راوێژی کرد تا چ کەسێك وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە دەستنیشان بکات. عەبدولکەریم ووتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، پیاوێك کەلەروانگەی دوورئەندێشی و بەهێزی دەتوانێت کاروبارەکانی خوراسان راپەڕێنێت، کرمانییە. هوشام پەسەندی نەکرد و وتی: ناوی

چییە؟ وتی: جودەیع کوڕی عەلی. هوشام ڕازی نەبوو و وتی: پێویستم بەو نییە. وتی: پیری بەئەزمون، یەحیا کوڕی نوعەیم کوڕی هوبەیرەی شەیبانیە. وتی خەڵکی ڕەبیعە ئەو کەسانە نین بتوانرێت بەهێزی ئەوان سنورەکان بەهێز و بپارێزین. عەبدولکەریم دەڵێت: بەخۆمم وت: یەمەن و ڕەبیعەی پەسەند نەکرد، کارەکان بەموزەریەکان دەسپێرم. وتم: عەقیل کوڕی مەعقەلی لەیسی ئەگەر لەهەڵەکەی ئەو چاوبپۆشیت. وتی: کامەیە؟ وتم: داوێن پاك نییە. وتی: پێویستم بەو نییە. وتم: مەنسور کوڕی ئەبی خەرقای سولەمی ئەگەر گرنگی بەمەترسیدار بوونی نەدەیت چوونکە پیاوێکی شوومە. وتی: کەسێکی دیکە دەستنیشان بکە. وتم: موجەشەر کوڕی موزاحیمی سولەمی چوونکە پیاوێکی بیرمەند و فرەزان و بووێرە و ئەندێشەیەکی ڕۆشنی هەیە هەرچەند هەندێ کات درۆ دەکات. وتی: درۆ پەسەندکراو نییە. وتیم: یەحیا کوڕی حوزەین. وتی: پێم نەوتی ناتوانین سنورەکان بەهێز و دەسەڵاتی خەڵکانی ڕەبیعە بپارێزێن؟ دەڵێت: وتم: نەسر کوڕی سەیار. وتی: پیاوی ئەم کارە ئەوە. وتم: ئەگەر گرنگی بەشتێك نەدەیت چوونکە ئەو داوێن پاك و فرەزان و بیرمەندە. وتی: چییە؟ وتم: ژمارەی کەسەکان و بنەماڵەکەی لەوێ کەمە. وتی: بێ باوك! دەتەوێت ژمارەی کەسەکانی لەمن زیاتر بێت؟ من تەواوکەری بنەماڵەی ئەوم. فەرمانی ئەو کارەی نووسی و بەعەبدولکەریم ڕەوانەی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: عوسمان کوڕی شێخەیریان پێ پێشنیار کرد و سەبارەت بەو وترا: پیاوێکی مەیخۆرە. یەحیا کوڕی حوزەینیان پێشنیار کرد و سەبارەت بەو وترا: بەردەوام گرفتاری سەرگەردانی دەبێت. قەتەن کوڕی قوتەیبەیان پێشنیار کرد و سەبارەت بەو وترا: پیاوێکی داغدارە و بەناچار تۆڵە دەستێنێتەوە. ئەوانی پەسەند نەکرد بەڵکو نەسر کوڕی سەیاری وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەستنیشان کرد.

جەعفەر کوڕی حەنزەلە کەئەسەد لەکاتی مردن ئەوی وەك فەرمانڕدوای خوراسان دەستنیشان کرد، پێشنیاری بەنەسر کرد تا بیکاتە فەرمانڕەوای بووخارا. ئەو لەگەڵ بەختەری کوڕی موجاهید موالی بەنی شەیبان ڕاوێژی کرد کەپێی وت: بەوە ڕازی مەبە ببیتە فەرمانڕەوای بووخارا چوونکە تۆ پیری موزەریەکانی لەخوراسان، بەم زوانە دەبیتە فەرمانڕەوای تەواوی خوراسان. کاتێك فەرمانی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی

پێگەیشت، کەسی بۆ لای بەختەری ڕەوانە و ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کرد. بەختەری بەهاوەلآنی خۆی وت: نەسر بۆتە فەرمانڕەوای خوراسان. کاتێك بەختەری ڕۆشتە وەك فەرمانداری سلآوی بۆ نارد. نەسر پرسی: لەکوێوە زانیت؟ بەختەری وتی: پێشتر تۆ بۆ لای من دەهاتیت، کاتێك کەست نارد بەشوێن مندا، زانیم کەبوویتە فەرماندار.

کاتێك عەبدولکەریم فەرمانەکەی بۆ نەسر هێنا، دەهەزار درەمی وەك مژدانە پێبەخشی. موسلیم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی موسلیمی کردە فەرمانڕەوای بەلخ، وەساج کوڕی بووکەیر کوڕی وەساجی کردە فەرمانداری مەرورود، حارس کوڕی عەبدوالله کوڕی حەشرەجی کردە فەرمانداری هەرات، زیاد کوڕی عەبدولرەحمانی قوشەیری کردە فەرمانداری نەیشابوور، باوکی حەفص کوڕی عەلی کوڕی خەتەنەی کردە فەرمانداری خوارەزم و قەتەن کوڕی قوتەیبەی کردە فەرمانڕەوای سەغد. پیاوێك لەیەمانییەکان وتی: دەمارگیرییەکی لەو چەشنەم نەبینوە. وتی: بەڵێ. دەمارگیرییەکە ئەوە بوو کەچوار ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و جگە لەخەڵکانی موزەری نەکردە فەرماندار و فەرمانڕەوا. خوراسان ئاوەدانییەکی بێ وێنەی بەخۆیەوە بینی و بەباشترین شێوە باج و خەراج کۆدەکرایەوە. سوار کوڕی ئەشعەر وتی:

| | |
|---|---|
| اضحت خراسان بعد الخوف آمنة | من ظلم كل غشوم الحكم جبار |
| لما اتى يوسفا اخبار ما لقيت | اختار نصرا لها نصر بن سيار |

یانی: خوراسان بەدوای ڕۆژگارێك لەترس و تۆقان، بەئاسوودەی و ئارامی گەیشت و لەفەرمانڕەوایی هەر ستەمکارێکی یاخی ئاسوودە بوو. کاتێك یوسفیان ئاگادار کردەوە کەخوراسان چی بەسەر هاتووە، جوامێری و هاریکاری نەسر کوڕی سەیاری هەڵبژارد.

نەسر فەرمانی فەرمانڕەوایەتی، لەمانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٠/ ژونیەی ٧٣٨ زایینی بەدەستی گەیشت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، لەهاویندا شەڕ و دەستی بەسەر سەندرەدا گرت. هەروەها ئیسحاق کوڕی سەلەم ڕووبەڕووی تومان شا بوویەوە و قەلاَکانی وێران و ئەو سەرزەمینەی بەتەواوی لەناو برد.

محەممەد کوڕی هوشامی مەخزومی ئایینی حەجی لەم ساڵەدا ئەنجامدا یا سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك یا براکەی یەزید کوڕی هوشام. کارگوزاری مەککە و مەدینە و تایف، محەممەد کوڕی هوشامی مەخزومی بوو. فەرمانڕەوای عێراق و ڕۆژهەلاَت یوسف کوڕی عومەر و لە خوراسان نەسر کوڕی سەیار فەرمانڕەوایەتی دەکرد کەهوشام فەرمانی پێدابوو نامە بۆ یوسف کوڕی عومەر بنووسێت ((دەستەیەك دەڵێن فەرمانڕەوا لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی حەنزەلە بوو)) لەبەسرە، کەسیر کوڕی عەبدواللە سولەمی، کارگزاری یوسف، فەرمانڕەوایی دەکرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی داد، عامر کوڕی عوبەیدە بوو. لەئەرمەنستان و ئازەربایەجان، مەروان کوڕی محەممەد فەرمانڕەوایەتی دەکرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، کوڕی شیبرەمە بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە، مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کەدەستەیەك دەڵێن لەساڵی ١٢١/ ٧٣٩ زایینی مرد، قەیس کوڕی موسلیم، محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حارسی تەمیمی، حەماد کوڕی سلێمانی فەقیە، واقد کوڕی عەمرۆ کوڕی سەعد کوڕی مەعاز، عەلی کوڕی مودەرەکی نەخەعی کوفی، قاسم کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدواللە کوڕی مەسعودی کوفی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و یەکی کۆچی (( ٧٣٩ زایینی ))

لەم ساڵەدا مەسلەمە کوڕی هوشام، لەسەرزەمینی ڕۆم شەڕی کرد و دەستی بەسەر چەندین هەماری گەورەدا گرت کەبۆ کۆکردنەوەی دانەوێڵە دروست کرا بوون.

## دەرکەوتنی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین

دەڵێن: زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین لەم ساڵە یا لەساڵی ١٢٢/ ٧٤٠ زایینی کوژرا. لەئێستادا هۆکارەکانی ناسازگاری ئەو لەگەڵ هوشام و بەیعەتی ئەو لەگەڵ هوشام و چۆنیەتی کوژرانەکەی باس دەکەین.

سەبارەت بەهۆکاری ناسازگاری بۆچوون و گێڕانەوەکان جیاوازن. دەستەیەك دەڵێن: زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین و داوود کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله و محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، لەخوراسان ڕۆشتنە لای خالید کوڕی عەبدوالله‌ی قەسری کەزێر و زیوی بەوان بەخشی و ئەوان بۆ مەدینە گەڕانەوە. کاتێك یوسف کوڕی عومەر هاتە سەر کار، ئەم هەواڵەی بۆ هوشام نووسی و بیری خستەوە کەخالید پارچە زەوییەکی لەمەدینە بەبەهای دەهەزار دینار لەکوڕی عەلی (زەید) کڕیوە بەڵام دواتر پارچە زەویەکەی بۆ گەڕاندۆتەوە. هوشام نامەی بۆ کارگوزاری مەدینە نووسی تا ئەو کەسانە بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. ئەو کارەی کرد و هوشام سەبارەت بەوەرگرتنی زێر و زیو پرسیاری کرد. وتیان: زێر و زیویان وەرگرتووە و وتەکانی دیکەیان سەبارەت بەزەویەکە بەدرۆ لەقەڵەمدا و سوێندیان خوارد. هوشام ئەوانی بەراستگۆ زانی و فەرمانی پێدان بۆ عێراق بگەڕێندوە تا ڕووبەڕووی خالید بکرێنەوە. بەدڵخواز، یا نابەدڵ، بۆ ئەوێ بەرێکەوتن و دووبارە گەڕانەوە بۆ مەدینە. کاتێك گەیشتنە قادسیە، خەڵکانی کوفە نامەیان بۆ زەید کوڕی عەلی نووسی و ئەو بۆ لای ئەوان گەڕایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو خالیدی قەسری داوایەکی بەرز کردەوە کەئەندازەیەك سامانی بەزەید و داوود کوڕی عەلی و چەند کەسێکی دیکە لەقوڕەیشیەکان سپاردووە. یوسف چۆنیەتی ئەو کارەی بۆ هوشام نووسی. هوشام ئەوانی

لەمەدینەوە بانگ کرد و بۆ لای یوسفی ناردن تا رووبەرووی خالیدیان بکاتەوە. ئەوان بەرێکەوتن. یوسف بەزەیدی وت: خالید گومان دەکات برێك سامانی بەتۆ سپاردووە. زەید وتی: ئەو کە لەسەر تەختی وتاردان جوێن بەباوکانی من دەدات، چۆن دەتوانێت سامان بەمن بسپێرێت؟ کەسی بۆ لای خالید ڕەوانە کرد و ئەویان بەجل و بەرگی ناو ماڵەوە هێنا، وتی: زەید حاشا لەوە دەکات کەتۆ سامانت بەو سپاردبێت. خالید سەیری زەید و یوسفی کرد و وتی: دەتەوێت بەو گوناحانەی من کە لەسەر شانی تۆیە، قورسایی گوناحی ئەم پیاوەیش بخەیتە سەر شانی خۆت. چۆن دەتوانم سامان بەو بسپێرم لەکاتێکدا لەسەر تەختی وتاردان بەردەوام سەرکۆنەی باوکانی ئەوم کردووە؟ لەخالیدیان پرسی: بۆ ئەو کارەت کرد؟ وتی: ئەشکەنجەی دام و لەژێر زەختی ئەشکەنجە ئەو وشانەم هێنایە سەرزمان. هیوادار بووم پێش هاتنی ئێوە خوا دەرگایەکم بەروودا بکاتەوە. گەڕانەوە.

دەستەیەك دەڵێن: یەزید کوڕی خالیدی قەسری بوو کەوتی برێك سامانی بەزەید سپاردووە.

کاتێك هوشام فەرمانی پێدان بڕۆنە لای یوسف لەعێراق، لەترسی یوسف، داوایان لێکرد بیانبەخشێ تا لەقامچییەکانی ستەمکاری ئەو پارێزراو بن. هوشام وتی: نامەی بۆ دەنووسم تا ئازاری ئێوە نەدات. ئەوانی بەزۆر بۆ لای یوسف ڕەوانە کرد.

یوسف ئەوان و یەزیدی روبەروی یەك دانیشاند. یەزید وتی: ئەوان لای من هیچ کەم و زیادێکیان نییە. یوسف وتی: گاڵتە بەمن دەکەیت یا سەروەری باوەڕداران؟ ئەوەندە ئەشکەنجەی کرد کەلەمردن نزیك بوویەوە. دواتر فەرمانیدا لەنۆکەرەکانیاندا و زەیدیان بەرەڵا کرد. سەرئەنجام سوێندیدان و ئازادی کردن. ئەوان گەڕانەوە بۆ مەدینە و زەید لەکوفە مایەوە. زەید، ئەو کاتەی هوشام، ئەوی بۆ لای یوسف ڕەوانە کردبوو، بەهوشامی وت: لەوە ئاسوودە نیم ئەگەر من بۆ لای یوسف ڕەوانە بکەیت، من و تۆ بەهیچ شێوەیەك نەتوانین بەزیندووی چاومان بەیەك بکەوێت (ئەو دەمکوژێت) وەڵامی دایەوە: بەناچاری وبێ چەند و چوون، دەبێت بڕۆیت. بەرێکەوتن.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکارەکەی ئەوە بوو کەزەید لەسەر سەرپەرەستی کردنی میراتی عەلی کوڕی ئەبی تالب لەگەڵ کوڕە مامەکەی دژایەتییان هەبوو. زەید پشتیوانی لەمناڵەکانی حسەین دەکرد و جەعفەر لەمناڵەکانی حەسەن. ئەوان لای فەرماندار تا بنج

و بناوانی بابەتەکەیان توێکاری دەکرد و هەڵدەستان و هیچ شتێکیان نەدەگێڕایەوە.

کاتێك جەعفەر مرد، عەبدوڵڵا کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، دژایەتی کرد. ڕۆژێك داوەرییان بردە لای خالید کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی حارس لەمەدینە. عەبدوڵڵا بەشێوەیەکی ناشیرین لەگەڵ زەید قسەی کرد و وتی: ئەی زادەی ژنی سندی نەژاد، زەید پێکەنی و وتی: ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم، پێغەمبەری خوا کەنیزێکی بوو و لەگەڵ ئەمەیشدا، دوای مردنی خاوەنەکەی، لەماڵەوە مایەوە و چیتر هاوسەرگیری نەکرد. ئەم وتارە، تانەیەك بوو لەفاتیمە کچی حسەین و دایکی عەبدوڵڵا، کەدوای مردنی باوکی عەبدوڵڵا یانی حەسەن کوڕی حەسەن، شووی کردەوە. زەید لەوتەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و شەرمەزاری لای فاتیمە بوو چوونکە ئەم خاتونە، پووری بوو. زەید بۆ ڕۆژگارێك، شەرمی دەکرد سەردانی فاتیمە بکات تا ئەوەی ژنەکە خۆی پەیامی بۆ نارد: برازا بەرێزەکەم، باش دەزانم دایکت لای تۆ، هاوشێوەی دایکی عەبدوڵڵا بۆ عەبدوڵڵا بەرێزە. بەعەبدوڵڵای وت: وتارێکی قێزەونت سەبارەت بەدایکی زەید هێنایە سەرزمان. سوێند بەخوا دایکی ئەو بۆ بنەماڵەکەی ئێمە، خاتونێکی بەرێز و پێ پیرۆز بوو. دەڵێت: پێی وتن کەخالید وتوویەتی بەیانی وەرن بۆلام، ئەگەر نەتوانم کۆتایی بەکێشەکەی ئێوە بێنم، خالید کوڕی عەبدولمەلیك نیم. ئەو شەوە شاری مدینە وەك قازان دەکولا. یەك دەیوت: زەید ئەم قسەی هێناوەتە سەرزمان و ئەوی دیکە: عەبدوڵڵا ئەوەی باس کرد.

بۆ بەیانی، خالید لەمزگەوت دانیشت و خەڵك، کۆبوونەوە. دەستەیەك سەرکۆنەیان دەکرد و دەستەیەك خەمبار بوون. خالید ئەو دووانەی بانگ کرد و هیوادار بوو جوێن بەیەك بدەن تا ئابڕوویان بەتەواوی بچێت. عەبدوڵڵا ویستی دەم بکاتەوە بەلام زەید پێی وت: ئەی باوکی محەممەد، پەلە مەکە، هەموو کۆیلەکانی زەید ئازاد بن ئەگەر مەبەستی ئەوەی گردبێت داوەری بێنێتە لای خالید!

رووی کردە خالید و وتی: زادەکانی پێغەمبەری ڕێزدارت بۆ کارێك کۆکردۆتەوە کە نەئەبووبەکر ئەو کارەی دەکرد نەعومەر کوڕی خەتاب! خالید وتی: کەس نییە تا وەلامی ئەم نەزانە بداتەوە؟ پیاوێك لەئەنسار لەبنەماڵەی عەمرۆ کوڕی حەزم دەستی بەقسە کردن کردە و وتی: ئەی زادەی باوکی توراب، زادەی حسەینی کەم ئاوز! ئایا فەرماندار هیچ مافێکی لەملی تۆدا نییە؟ زەید وتی: پیاوی قەحتانی، بێدەنگ بە چوونکە تۆ

بەشیاوی وەڵامدانەوە نابینم. قەحتانی وتی: بۆ وەڵامی من نادەیتەوە؟ سوێند بەخوا لەتۆ باشترم، باوکم لەباوکی تۆ باشتر و دایکم لەدایکی تۆ باشتر بوو. زەید پێکەنی و وتی: ئەی قورەیشیەکان، ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەناوچوو و بنەماڵەکان نەژادی خۆیان لەدەستدا. سوێند بەخوا ئەگەری هەیە ئایینی خەڵکێك لەناو بچێت بەڵام نەژادیان دەمێنێتەوە. عەبدوالله کوڕی واقد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی خەتاب هەستا و وتی: پیاوی قەحتانی، درۆت کرد و سەرت دای لەبەرد. ئەو لەچاوی تۆ وەك ئاسمان لەچاوی زەویدایە، خۆی، باوکی، دایکی، نەژادی، بنەماڵەکەی، زۆری ئیهانەی پیاوی قەحتانی کرد.

ئەوسا مشتێك خۆڵی هەڵگرت و وتی: سوێند بەخوا چیتر بێزار بووین.

زەید بەرەو دەرباری هوشام کوڕی عەبدولمەلیك بەرێکەوت و ڕۆشتە شام. ویستی بڕواتە لای هوشام. بەڵام هوشام لەمۆڵەت بەخشین بەو خۆی بەدوور دەگرت. زەید بەردەوام نامەی دەنووسی و داوای دەکرد هوشام ببینێت و هوشام هەموو جارێك لەخوارەوەی نامەکەی دەینووسی: بۆ لای فەرماندارەکەت بگەڕێرەوە. زەیدیش دەیوت: سوێند بەخوا هیچ کات بۆ لای خالید ناگەڕێمەوە. دوای ماوەیەك چاوەڕوانی زۆر، سەرئەنجام ڕۆژێك مۆڵەتی پێدا و ڕۆشتە سەر شوێنێکی بەرز و فەرمانی بەیەکێك لەکۆیلەکانیدا بەشێوەیەکی زۆر نەرم و لەسەرخۆ کەزەید ئاگادار نەبێتەوە، بەدوای ئەودا بڕوات تا بزانێت زەید چی دەڵێت. زەید کەپیاوێکی گەورە بوو، ڕۆشتەسەر و بێزار بوو. لەسەر یەکێك لەقادرمەکان دانیشت و بیستڕا کەدەیوت: سوێند بەخوا کەس خوازیاری ئەم جیهانە نابێت مەگەر ئەوەی ریسوا ببێت. دواتر بۆ لای هوشام سەرکەوت. لەکاتی گفتوگۆ، سەبارەت بەشتێك، سوێندی بۆ هوشام خوارد. هوشام وتی: بەراستی نازانم. زەید وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند پێگەی کەسێکی لەوە بەرزتر نەکردۆتەوە کەبەخواوەند ڕەزامەند و شادمان بێت. هوشام وتی: ئەی زەید، بیستومە ناوی خەلافەت دەهێنیتە سەر زمان و ئەو ئارەزوە لەسەردا پەروەردە دەکەیت بەڵام شیاوی ئەم پێگەیە نیت چوونکە دایکت کەنیزێك زیاتر نەبووە. زەید وتی: وەڵامت هەیە. هوشام وتی: قسە بکە. زەید وتی: کەس لای خواوەند پێگەی بەرزتر لە پێغەمبەر(د.خ) نییە چوونکە خۆی هەڵیبژارد و ڕەوانەی کرد. ئیسماعیل کوڕی کەنیزێك بوو و براکەی ئیسحاق کوڕی

ژنێکی ئازادە. خواوەند لەپێشی بەزادەی کەنیز بەخشی و لەپشتی ئەو باشترینی خەڵکانی ئافراند. کەسێك کەباوەگەوڕێی پێغەمبەر(د.خ) و باوکی عەلی ودایکی فاتیمەیە، ترسی نییە دایکی کێ بێت. هوشام پێی وت: بڕۆدەر. زەید وتی: دەڕۆم و تەنیا لەشوێنێك، دەژیم کەتۆ پەسەندی ناکەیت. سالم پێی وت: ئەی باوکی حسەین، ئەم داستانە لای کەس باس مەکە.

زەید ڕۆشتەدەر و بەرەو کوفە بەرێکەوت. محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، پێی وت: ئەی زەید، سوێندت دەدەم بەخوا، بۆ لای بنەماڵەکەت بگەڕێیتەوە و لەکوفە بڕۆیتەدەر. چوونکە کوفیەکان لەسەر پەیمانەکانی خۆیان نامێنن و ڕێز لەوتەکانی خۆیان ناگرن. زەید رازی نەبوو. پێی وت: ئێمەی بەئەسیری گرت و بێ گوناح، لەحیجازەوە ئێمەی ڕەوانەی شام کرد و دواتر بۆ جەزیرە و دواتر بۆ عێراق بۆ لای قەیسیانی سەقیف، تا گاڵتەمان پێبکات. دووبارە وتی:

| | |
|---|---|
| بكرت تخوفنى الحتوف كاننى | اصبحت عن عرض الحياة بمعزل |
| فاجبتها ان المنية منهل | لابد ان اسقى بكأس المنهل |
| ان المنية لو تمثل مثلث | مثلى اذا نزلوا بضيق المنزل |
| فاقنى حياءك لا ابالك و اعلمى | انى امرو سأموت ان لم اقتل |

یانی: نیگاری من دەستی بەترساندنی من لەمەرگ و کوژران کرد. وەك بڵێی من لەچارەنووسەکانی ژیان بەدوورم. وەڵامم دایەوە کەمەرگ شوێنی ئاو خواردنەوەی دیاریکراوی هەیە و من بەناچاری دەبێت قاپێك لەم ئاوە بخۆمەوە. ئەگەر روخساری خۆی نیشان بدات، بەرووی مندا دەردەکەوێت و بەرووی ئەو کاروانیانەی لەناچاریدا لەشوێنێکی تەنگ و تەسك دادەبەزن. شەرمی خۆت بشارەوە ((لەپرسەی باوکتا دانیشیت)) ئەوەیش باش بزانە کەپیاوێکم ئەگەر نەکوژرێم، بەناچار دەبێت بمرم و گیانم تەسلیم بکەم.

تۆ بەخوا دەسپێرم. لەگەڵ خواوەند پەیمان دەبەستم تا ئەو کاتەی یەك دەست بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ ئومەوی و مەروانیەکان درێژ ببێت، باوەش بۆ ژیان ناکەمەوە و ڕێگەی مەرگ دەبڕم. لێی جیابوویەوە و بەرەو کوفە بەرێکەوت و لەوێ، بەشێوەیەکی نهێنی ژیانی دەستپێکرد و لەماڵەجۆراوجۆرەکان دەژیا. شیعیەکان بۆ لای ئەو هاتوچۆیان

دەکرد و دەستەیەك، بەیعەتیان لەگەڵ کرد. لەناو ئەوان: سەلە کوڕی کوهەیل، نەسر کوڕی خەزیمەی عەبسی، معاویە کوڕی ئیسحاق کوڕی زەید کوڕی حارسەی ئەنساری و کەسانێکی زۆر لەگەورەکانی کوفە. وتاری ئەو لەکاتی بەیعەت وەرگرتن بەمشێوەیە بوو: ئێمە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ نووسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەر(د.خ) وشەڕ لەگەڵ ستەمکاران و ڕێز گرتن لەهەژار و دەستکورتەکان و یارمەتیدانی نەداران و دابەش کردنی تالآنیەکانی شەڕ بەشێوەیەکی بەرابەر لەناو خەڵکان و گەڕاندنەوەی ئەو سامان وماڵانەی بەزۆر دەستیان بەسەردا گیراوە و هاوکاری کردنی بنەماڵەی پێغەمبەرتان پێدەکەین. ئایا لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەت دەکەن؟ ئەگەر دەیانوت: بەڵێ، دەستی دەخستە دەستی ئەوان و دەیوت: پەیمان و بەڵێنی خوا و پێغەمبەر(د.خ) لەئەستۆی ئێوەدا بێت کەبەئاشکرا و نهێنی چاکەخوازی من بن. ئەگەر دەیوت: بەڵێ. دەستی دەگووشی و دواتر دەیوت: ئەی خوایە، شایەت بە. پانزە هەزار یا چل هەزار کەس بەیعەتیان لەگەڵ کرد و فەرمانی خۆ ئامادە کردنی پێدان. ئەو کەسانەی دەیانویست ڕێز لەپەیمانەکەی خۆیان بگرن و بۆ شەڕ خۆیان ئامادە و ڕوو لەگۆڕەپانی شەڕ بکەن، بەدوای ئەودا دەگەڕان. لەم ڕێگەوە، کارەکەی ئەو لەناو خەڵکان دەنگیدایەوە.

ئەم گێڕانەوەیە، بەپێی وتاری کەسێکە گومان دەکات ئەو لەشامەوە بەشێوەیەکی نهێنی هاتە کوفە و خۆی لەخەڵکان بەدوور دەگرت. بەڵام بەپێی وتاری ئەو کەسەی گومان دەکات ئەو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ خالیدی قەسری یا کوڕەکەی خالید ڕۆشتە لای یوسف، بەمشێوەیە دەستپێدەکات کە: زەید بەشێوەیەکی ئاشکرا لەکوفە مایەوە و داوود کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی لەگەڵدا بوو. شیعەکان بۆ لای ئەو هاتوچۆیان دەکرد و داوایان لێکرد بزوتنەوەکەی خۆی دەستپێبکات. پێیان وت: هیواداریین کەمەنسور (مەهدی ڕۆژگاری کۆتایی، سۆشیانس) تۆ بیت و ئەم ڕۆژگارە، ڕۆژگاری لەناوچوونی ئومەوییەکان بێت. ئەو لەکوفە مایەوە. یوسف کوڕی عومەر بەردەوام سەبارەت بەو پرسیاری دەکرد و پێی دەوترا: زەید لێرەیە.، کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە و بانگی دەکرد. زەید دەیوت: دێم. ئەوسا بەبیانوی نەخۆشی نەدەڕۆشت و تا ئەو کاتەی خواوەند، مەبەستی کرد، لەو شارەدا مایەوە.

یوسف کەسێکی بەدوای ئەودا نارد و داوای کرد بەزوترین کات بگاتە لای. زەید

بیانووی هێنایەوە کەسەرقاڵی کرینی ئەو کەل و پەلانەیە کەپێویستی پێیانە. دووبارە نێردراوێکی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا کوفە بەجێبێڵێت. زەید بیانوی هێنایەوە کەدەستەیەك لەکەسانی بنەماڵەی تەلحە کوڕی عوبەیدالله‌ی لەسەر پارچە زەویەك، بڕۆدتە بەردەم داوەر. یوسف پەیامی بۆ نارد: کەسێك وەك نوێنەری خۆت دیاری بکە و لەکوفە بڕۆ. کاتێك پێداگری یوسفی بینی، لەکوفە ڕۆشت و بەرەو قادسیە ملی ڕێگەی گرتەبەر.

دەستەیەك دەڵێن: بەرەو سەعلەبیە ڕۆشت. خەڵکانی کوفە شوێنی کەوتن و وتیان: ئێمە چل هەزار پیاوی شمشێر وەشێنین کەهیچ کات بەتەنیا جێت ناهێڵین و بەشمشێرەکانی خۆمان بەرگری و پارێزگاری لەتۆ دەکەین. خەڵکانی شام لێرە فراوان نین و بە خواستی خواوەند تەنیا یەك هۆز لەهۆزەکانی ئێمە، هەموو خەڵکانی شام لەناو دەبات. چەندین سوێندی گەورە و گرانیان بۆ خوارد. بەردەوام دەیوت: دەترسم ئەو بەڵایە بەسەر من بێنن کە بەسەر باوکانی مندا هێناتان. دووبارە سوێندیان بۆ خوارد. داوود کوڕی عەلی پێی وت: کوڕی مام، ئەمانە فریوت دەدەن مەگەر ئەوان نەبوون کەسانێکی بەرێزتر لەخۆتیان وەك عەلی کوڕی ئەبی تالب فریودا تا کوژرا؟ دوای ئەو حەسەنیان فریودا چوونکە سەرەتا بەیعەتیان لەگەڵ کرد و دواتر هێرشیان کردەسەر و عاباکەیان فڕاند و بریندداریان کرد، مەگەر نەیانکرد؟ مەگەر ئەمانە نەبوون حسەینیان لەماڵەکەی خۆی ئاوارە کرد. نامەیان بۆ نووسی و بەڵێنیان پێدا و دواتر هێرشیان کردە سەر و تەسلیمی دوژمنیان کرد و بەمەیش نەوەستانەوە و کوشتیان. لەگەڵ ئەوان هاوکاری مەکە. خەڵکانی کوفە وتیان: ئەم پیاوە ((داوود کوڕی عەلی) نایەوێت تۆ سەرکەوتن بەدەست بێنیت چوونکە گومان دەکات خۆی و بنەماڵەکەی بۆ ئەم کارە شیاوترن. زەید بەداوودی وت: کەسێکی وەك معاویە ڕووبەڕوی عەلی بوویەوە کە لەفرت و فێڵ هاوشێوەی نەبینراوە و خەڵکانی شام پشتیوانیان لێدەکرد. حسەین کاتێك لەگەڵ یەزید شەڕی کرد کەجیهان باوەشی بۆ ئومەوییەکان کردبوویەوە. داوود وتی: دەترسم ئەگەر هاوڕێیەتی ئەوان بکەیت و بۆ کوفە بگەڕێیتەوە، کەس لەمان زیاتر خراپەخوازی تۆ نەبێت بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا خۆت باشتر دەزانی چی بکەیت و چی نەکەیت.

داوود بەرەو مەدینە و زەید بۆ کوفە گەڕایەوە. کاتێك زەید گەڕایەوە، سەلە کوڕی

کوهەیل ڕۆشتە لای و نزیك بوونی خۆی لەپێغەمبەر(د.خ) باس کرد و وتی: مافێکی گەورەت لەملی ئێمەدا هەیە. وتارێکی شیرینی هێنایە سەرزمان و دواتر وتی: سوێندت دەدەم بەخوا چەند کەس بەیعەتی لەگەڵ کردوویت؟ وتی: چل هەزار کەس. وتی: چەند کەس لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی بەیعەتیان کرد؟ وتی: هەشتا هەزار کەس. وتی: چەند کەس لای ئەو مانەوە؟ وتی: سێسەد پیاوی شەڕکەر. وتیك سوێندت دەدەم بەخوا تۆ باشتریت یا حسەین کوڕی عەلی؟ وتی: حسەین کوڕی عەلی. وتی: ڕۆژگاری ئێستا باشترە یا ئەو سا؟ وتی: ئەوکات. وتی: مەگەر ئەوان خیانەتیان لەحسەین نەکرد؟ ئێستا چاوەڕوانی هاوکاری تۆ بکەن؟ وتی: بەیعەتیان لەگەڵ من کردووە و بەیعەتەکە لەئەستۆی من و ئەواندایە. وتی: ئایا ڕێگەم پێدەدەیت لەم شارە بڕۆمەدەر؟ دەترسم ڕوداوێکی ناخۆش بۆ تۆ ڕووبدات و نەتواتم خۆم بگرم. زەید مۆڵەتی پێدا و ئەو بەرەو یەمامە بەرێکەوت. پێشتر ئاماژەمان بەداستانی بەیعەتی سەلە دا.

عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن نامەی بۆ زەید نووسی: دوای سڵاو، کوفیەکان بەئاشکرا خۆیان بەدۆست دەناسێن و بەنهێنی ئاژاوە دەنێنەوە و پێستی تۆ دادەماڵن. زمانیان پێش دەخەن و دڵیان لەگەڵ زمانیان نییە. ئەوان چەندین نامەیشیان بۆ من نووسی. بەلاّم من گرنگیم بەوتەکانی ئەوان نەدا و پەیوەندی خۆم لەگەڵ ئەوان پچڕاند. لەبەر ئەوەی ئەوان بەریسوا و کەم بەها دەزانم و لێیان بێزارم. داستانی ئەوان هاوشێوەی ئەوەیە کەعەلی کوڕی ئەبی تالب باسی دەکات و دەڵێت: ئەی خەڵکانی کوفە، ئەگەر ئێوە بەخۆتان بسپێرن، بۆ هەڵیت و پلیت و زمان درێژی پاڵەوانن بەلاّم لەکاتی شەڕ تەمەڵ و لاواز. ئەگەر خەڵکان لەدەوری ڕێبەرێك کۆببنەوە، خراپەی ئەو دەهێننە سەرزمان و ئەگەر بتانبەنە گۆڕەپانی شەڕ، پاشەکشێ دەکەن و هەڵدێن و هاوشێوەی مشك دەخزێنە ناو کونەکانی خۆتان و دوای ئەوە لەگەڵ خەیاڵە خاوەکانی خۆتان ژیان بەسەر دەبەن.

زەید گرنگی بەهیچ کام لەئامۆژگاریانە نەدا. بڕیاری مانەوەی لەکوفەدا و سەرقاڵی بەیعەت وەرگرتن لەخەڵکان بوو. لەم شارە، کچی یەعقوب کوڕی عەبدواللەی سولەمی وەك هاوسەر هەڵبژارد هەروەها کچی عەبدوالله کوڕی ئەبی عەنبەسی ئەزدیش.

هۆکاری هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچە ئەوە بوو کەدایکی دایکی عەمو و کچی سەڵت

لەشوێنکەوتەکانی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) بوو. ڕۆشتە لای زەید بۆ ئەوەی سڵاو و دروودی بۆ بنێرێت و بەزمانی خۆش دڵنەوایی بکاتەوە. ژنێکی جوان بوو بەڵام ساڵەکانی تەمەنی درێژ ببوویەوە هەرچەندە نیشانەکانی بەروخساریەوە دەرنەکەوتبوو. زەید خوازبێنی لێکرد. ئەو داوای بەخشینی کرد و وتی: تەمەنم درێژ بۆتەوە بەڵام کچێکم هەیە لەخۆم جوانتر و جەستەی لەبەفر سپیتر کەئەندامێکی رێك و دلرفێنی هەیە. زەید پێکەنی و هەمان سات ئەوی کردە هاوسەری خۆی. لەکوفەدا دەسوڕایەوە، هەندێ کات لای ئەم ژنە دەمایەوە و هەندێ کات لای ژنەکەی دیکەی. هەندێ لەکاتەکانی لەناو بەنی عەبەس بەسەر دەبرد و هەندێ کات لەناو بەنی تەغلەب و هەندێ کاتی لای کەسانی دیکە دەگوزەراند تا ئەوەی بزوتنەوەکەی خۆی دەستپێکرد.

شەڕەکانی نەسر کوڕی سەیار لەپشت ڕووبار((ماوەرئەلنەهر))

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی سەیار دوو جار لەماوەرا ئەلنەهر شەڕی کرد. یەکیان لەلای دەروازەی (نو، تازە)وە بوو. لەبەڵخەوە بەرەو ئەو پانتاییە بەرێکەوت و دواتر بۆ مەرو گەڕایەوە. وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە و ئاگاداری کردنەوە کەمەنسور کوڕی عومەر کوڕی ئەبی خەرقای بۆ وەرگرتنی سکاڵای خەڵکان دەستنیشان کردووە و باجی لەسەر ئەو کەسانە هەڵگرتووە کەباوەڕیان بەئیسلام هێناوە و قورسایی باجی خستۆتە ئەستۆی بتپەرستەکان. هەینیەك تێنەپەڕی کەسی هەزار موسوڵمان لەدەوری کۆبوونەوە کەباجی سەرانەیان دەدا. هەشتا هەزار بتپەرستیش لەسنورەکەی ئەودا بوون کەباجیان لەسەر هەڵگیرا بوو. قورسایی باجی خستە ئەستۆی ئەوان. دواتر کاروباری وەرگرتنی باجی رێکخست و هەموو کارێکی لەوادە و شوێنی خۆی ئەنجامدەدا. جارێکی دیکە بەمەبەستی شەڕ کردن ڕووی کردە وەرغسەر و سەمەرقەند و گەڕایەوە. جاری سێیەم بۆ شەڕی چاچ لەمەرو بەرێکەوت. کورسوڵ هاورێ لەگەڵ پانزە هەزار شەڕکەر ڕێگەی پەڕینەوەی ئەوی لەچاچ بەست. حارس کوڕی سورەیج لەگەڵ ئەواندا بوو. کورسول لەگەڵ چل هەزار پیاوی شەڕکەر پەڕییەوە و لەشەوێکی تاریك بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر سوپاکە. نەسر، بووخارا خوداە و خەڵکی بووخارا و سەمەرقەند و کێش و نەسەف هاورێیەتیان دەکرد کەژمارەیان بیست هەزار شەڕکەر بوو. نەسر هاواری کرد: کەس لەشوێنی خۆی نەجووڵێت، هەموان لەشوێنی خۆیان بمێننەوە. عاسم کوڕی عومەیر

سوپاسالاری خەڵکانی سەمەرقەند هاتەدەر و شەڕی لەگەڵ سوارە تورکەکان دەستپێکرد. هێرشی کردە سەر یەکێك لەوان و ئەسیری کرد و بینی یەکێك لەپاشاکانی ئەوانە کەچوار هەزار خێوەتی هەیە. ئەوی بردە لای نەسر. نەسر پرسی: کێیت؟ وتی: کورسوڵ. نەسر وتی: سپاس بۆ خوا کەدەستی منی بۆ سەر تۆ ئاوەڵا کرد. کورسوڵ وتی: لەکوشتنی پیردپیاوێکی بەتەمەن چاوەڕوانی چیت؟ چوار هەزار وشتر لەوشترەکانی تورکت پێدەدەم لەگەڵ هەزار مایین کەدەتوانی سوپاکەی خۆتی پێبەهێز بکەیت بەڵام دەبێت ئازادم بکەیت. نەسر لەگەڵ هاوەڵانی راوێژی کرد. وتیان: ئازادی بکە. پرسیاری تەمەنی ئەوی کرد. وتی: نازانم. وتی چەندجار شەڕت کردووە؟ وتی: حەفتا و دوو جار. وتی: ئایا لەشەڕی ((تینویەتی)) بەشداریت کردووە. وتی: بەڵێ. نەسر وتی: دوای ئەم هەموو شەڕانە، ئەگەر هەموو تیشکی هەتاو بەمن ببەخشیت، لەدەستی من رزگارت نابێت. بەعاسم کوڕی عومەیری سەعدی وت: هەستە و جل و بەرگ و کەرەستەکانی شەڕی ئەو بۆ خۆت هەڵبگرە. کورسوڵ وتی: چ کەسێك منی ئەسیر کرد؟ نەسر بەپێکەنینەوە وتی: یەزید کوڕی قرانی حەنزەلی. ئەوی بەدەست نیشاندا. کورسول وتی: ئەم پیاوە نەدەتوانێت قوونی خۆی بشوات نەدەتوانێت رێگە لەمیزی خۆی بگرێت، چۆن دەتوانێت من ئەسیر بکات؟ بڵێ چ کەسێك منی ئەسیر کردووە؟ وتی: عاسم کوڕی عومەیر. کورسوڵ وتی: ئێستا کەسوارەیەکی بوێر لەپاڵەوانە سوارکارەکان منی ئەسیر کردووە، هەست بەئازاری مەرگ ناکەم. نەسر ئەوی کوشت و لەکەناری روبار، هەڵیواسی.

عاسم کوڕی هورموز هەمان هەزار مەردە کە لەرۆژگاری قەحتەبە لەنەهاوەند کوژرا.

کاتێك کورسوڵ کوژرا، تورکەکان بیناکانی ئەویان وێران کرد و گوێی خۆیان بڕی و مووی خۆیان و کلکی ئەسپەکانیان کورت کردەوە. کاتێك نەسر مەبەستی گەڕانەوەی کرد، جەستەی ئەوی سوتاند تا ئێسقانەکانی هەڵنەگرنەوە و بەپیرۆزی نەزانن. ئەم کارە، لەکوژرانی ئەو، بۆ تورکەکان ناخۆشتر بوو. نەسر رووی کردە فەرغانە و هەزاران کەسی ئەسیر کرد.

یوسف کوڕی عومەر بۆ نەسری نووسی: هێرش بکەرە سەر ئەو پیاوەی کەکلکی خۆی لەچاچ درێژ کردووە، مەبەستی حارس کوڕی سورەیج بوو. ئەگەر بەسەر ئەواندا سەرکەوتیت، شارەکانیان وێران و ژن و منداڵەکانیان ئەسیربکە. ئاگادار بە لەخوێنی

موسوڵمانەکان مەلە نەکەیت. نەسر نامەکەی بۆ خەڵکان خوێندەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی کرد. یەحیا کوڕی حوزەین وتی: فەرمانی سەروەری باوەڕداران و فەرمانی سەروەری خۆت بەکار ببە. نەسر وتی: ئەی یەحیا، وتەی رۆژگاری عاسمت هێنایە سەرزمان، قاچت بەدەرباری خەلیفە کراوەتەوە و پێگەیەکی بەرزت بەدەست هێنا و بەخۆتت وت کەدەبێت قسەیەکی لەو چەشنە بێنمە سەرزمان، بەرێکەوە چوونکە تۆم کردە سەرکردەی پێشەنگەکانی خۆم. خەڵك یەحیایان سەرکۆنە کرد. یەحیا بەرەو چاج بەرێکەوت و حارس هێرشی کردە سەریان و دوو گەردونەی ((تۆپ هاوێژی) بۆ دانان و ئەخرەم و بەهادر تورك هێرشیان کردە سەرموسوڵمانەکان. ئەوانیان کوشت و سەری ئەوانیان بۆ ناو سوپای تورکەکان فرێدا. تورکەکان هاواریان کرد و خوازیاری ئاشتی بوون و بلاوەیان لێکرد.

نەسر شەڕی لەگەڵ خەڵکانی چاج کرد. پاشاکەیان بەئاشتی و دیاری پێشوازی لێکرد. نەسر پەیمانی لێوەرگرت تا حارس لەولاتەکەی دەربکات. پاشا ئەوی بۆ فاریاب دوورخستەوە. نەسر، نەیزەك کوڕی سالح موالی عەمرۆعاسی وەك فەرمانداری چاج دەستنیشان کرد و بەرێکەوت تا لەقەبا، لەپانتاییەکانی فەرغانە دابەزی. خەڵکان هەواڵی هاتنی ئەویان بیست و هەرچی گیا و رووەك بوو، ئاگریان تێبەردا و رێگەی گەیاندنی خۆراك و هۆکارەکانی ژیانیان پچڕاند. نەسر سوپاکەی ڕەوانە کرد تا هێرش بکەنە سەر ئەورەنگ زیب، پاشای فەرغانە. لەیەکێك لەقەلاکان گەمارۆیان خستەسەر. موسوڵمانان لەوان بێ ئاگا بوون و ئەو بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەریان و چوارپێکانی ئەوانی بەتالانی برد. نەسر پیاوانێکی لەتەمیم بەسەرکردایەتی محەممەد کوڕی موسەنا بۆ هێرش کردنە سەر ئەوان ڕەوانە کرد. موسوڵمانان لەسەر رێگەی ئەوان بۆسەیان نایەوە. هێرشیان کردە سەر ئەوان و فەرماندەکەی ئەوانیان کوشت و کوڕی فەرماندەکە و کەسانی دیکەیان ئەسیر کرد. نەسر ئەوی کوشت و سلێمان کوڕی سوڵی بەپەیمانی ئاشتی بۆ لای پاشای فەرغانە ڕەوانە کرد. ئەویان بۆ ناو گەنجخانەکان نارد تا بیانبینێت. دواتر بۆ لای پاشای فەرغانە گەڕایەوە. پرسی: رێگەی نێوان ئێمە و خۆتت چۆن بینی؟ وتی: پڕ لەئاو و گیا. پاشای فەرغانە ئەم قسەی پێ ناخۆش بوو، وتی: لەکوێوە دەزانیت؟ سلێمان وتی: من لەغەرشتسان و خوتەل و تەبەرستان شەڕم کردووە، چۆن ئەمە نازانم؟

وتی: بینیت چەندە هۆکارەکانی ژیان و کەرەستەکانی شەڕمان کۆکردۆتەوە؟ وتی: خۆ ئامادە کردن و پاشەکەوت کردنێکی پەسەندە بەڵام دەبێت بزانیت خاوەنی قەڵا لەچەند شتێك ئاسوودە نییە: لەزیانی نزیکترین خەڵکانی خۆی و بەهێزترینی ئەوان لەگیانی خۆی ئاسوودە نیە کەهێرشی بکاتە سەر و دەستی دۆستایەتی بۆ دوژمنەکەی درێژ بکات و بۆ گرتنەوەی شوێنەکەی ئەو هەوڵ بدات و بەم شێوەیە خۆی لەدوژمنەکەی نزیك بکاتەوە، یا ئەوەی پاشەکەوتەکەی کۆتایی پێدێت و بەناچاری دەبێت خۆی تەسلیمی دوژمنەکەی بکات یا گرفتاری بەلا و نەخۆشیەك دەبێت و لەزیانەکەی دەمرێت. پاشای فەرغانە ئەم وتاری پەسەند نەکرد. فەرمانی پێدا پەیمانی ئاشتیەکە، بێنێت. بەپەیمانەکە رازی بوو و دایکی لەگەڵ ئەودا ڕەوانە کرد کەهەموو کارەکان لەدەستی ئەودا بوو. ژنەکە ڕۆشتە لای نەسر. فەرمانی دانیشتنی پێدا و گفتوگۆیان دەست پێکرد. لەو قسانەی بەژنەکەی وت: هەر پاشایەك کەشەش خواستی گرانبایی نەبێت، پاشا نییە، وەزیرەکان کەباوەڕی پێیان هەبێت و نهێنیەکانی دڵی خۆی، لای ئەوان بدرکێنێت و راوێژیان لەگەڵ بکات، چێشتلێنەرێك کەکاتێك ئیشتایی خواردنی نەبوو، خواردنێکی بۆ ئامادە بکات تا ئیشتیایی ئەو ببزوێنێت، ژنێکی جوان تا کاتێك خەم دایدەگرێت، لەجوانی ئەو، خەمەکانی بڕەوێتەوە، قەڵایەکی بەهێز تا لەکاتی مەترسیدا پەنای بۆ ببات و خۆی رزگار بکات. مەبەستی سەمەندێکی تیژ پێ بوو و شمشێرێك کەکاتێك لەکاڵان دەریکێشا، هیچ کات کول نەبێت و بەشێوەیەك پاشەکەوت بکات کەلەهەر شوێنێکی زەویدا بێت، بتوانێت بێ ترس بەپشت بەستن بەوان درێژە بەژیانی بدات.

تەمیم کوڕی نەسر لەگەڵ دەستەیەك هاتنە ناو. ژن پرسی: ئەمە کێیە؟ وتیان: جوامێری خوراسان، تەمیم کوڕی نەسر. ژن وتی: نەشکۆی گەورەکانی هەیە و نە شیرینی مناڵەکان. حەجاج کوڕی قوتەیبە هاتەژوور. ژن پرسی: ئەمە کێیە؟ وتیان: حەجاج کوڕی قوتەیبە. ژن سڵاوی بۆ نارد و پرسیاری پێگە و پلەی ئەوی کرد و وتی: ئەی عەرەبەکان، ئێوە لەوەفاداری بەدوون، هاوکاری یەك ناکەن. قوتەیبە بوو ئەم وڵاتە پان و بەرینەی بۆ ئێوە ئامادە کرد و ئێستا ئەمە کوڕی ئەوە و لەخوار خۆتانەوە جێگەی دەکەنەوە. شیاوە لەجێگەی فەرمانڕەوا دانیشێت و فەرمانڕەوا لەشوێنەکەی ئەودا بێت.

## شەڕی مەروان کوڕی محەممەد

لەساڵی ١٢١/ ٧٣٩ زایینی، مەروان کوڕی محەممەد فەرمانڕەوای ئەرمەنستان بەمەبەستی شەڕ کردن لەقولاّییەکانی ئەم سەرزەمینە پێشڕەوی کرد و گەیشتە قەلاّی ((تەخت خانە)). خەڵکانی کوشتار و ئەسیر کرد. دواتر هێرشی کردە سەر قەلاّیەکی دیکە و کوشتاری خستە گەڕ. هێرشی کردە سەر غومیك کەقەلاّیەکە تەختی پاشا و ماڵەکەی لەوێ بوو. پاشا هەلاّت و پەنای بۆ قەلاّیەك برد کە بەخیزەج ناویان دەبرد. تەختی زێڕین لەو قەلاّیەدا بوو. مەروان هێرشی کردەسەر و لەهاوین و زستان شەڕی لەگەڵ کرد. پاشا لەسەر پێدانی ساڵانە هەزار سەڕ مەڕوماڵاّت و پێدانی هەزار (مودی) ( پێوانەیەك لەمیسر و شام بەرابەر لەگەڵ ١٩ صاع) ئاشتی لەگەڵ کرد. مەروان بەرێکەوت و هێرشی کردە سەر سەرزەمینی بەتران و لەگەڵ پاشاکەی پەیمانی ئاشتی بەست و دواتر ڕۆشتە سەرزەمینی تومان و لەگەڵ پاشاکەی ئاشتی کرد و دووبارە بەرێکەوت تا گەیشتە پانتاییەکانی حەمزین و شارەکانی ئەو دیارەی وێران و گەمارۆی خستە سەر قەلاّیەك لەقەلاّکانی ئەوان و بەئاشتی کۆتاییان بەشەڕ هێنا و بەدووای ئەمە، هێرشی کردەسەر ناوچەکانی مەسدار و بەئاشتی دەستی بەسەردا گرت و ئەوسا، لەکیران دابەزی و تەبەر سەران و فیلان بەئاشتی پێشوازییان لێکرد. هەموو ئەم شارانە لەکەنارەکانی دەریا لەئەرمەنستان تا تەبەرستان جێگیر بوون.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، مەسلەمە کوڕی هوشام لەگەڵ ڕۆمییەکان شەڕی کرد و دەستی بەسەر مەتاتیردا گرت. محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیلی مەخزمی ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا کەفەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف بوو. فەرمانڕەوای عێراق، یوسف کوڕی عومەر، لەخوراسان، نەسر کوڕی سەیار و لەئەرمەنستان و ئازەربایەجان، مەروان کوڕی محەممەد فەرمانڕەوایەتی دەکرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە، عامر کوڕی عوبەیدە و دامەزاروەی دادی کوفە، شیبرەمە بوو. هەروەها لەم ساڵەدا وەلید

کوڕی بووکەیر کارگوزاری موسڵ لەهەڵکەندی روبارێك کە بەم شارە کۆتایی دەهات، تەواو بوو. بۆ ئەم کارە لەسەرەتاوە تا کۆتایی هەشت هەزار هەزار درهەمی خەرج کرد. هەشت ئاشی لەدرێژی رێگەکە دروست کرد. هوشام داهاتی ئەم ئاشانەی بۆ پاك کردنەوە و نۆژەن کردنی روبارەکە، تەرخان کرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: سەلە کوڕی سوهەیل کەدەڵێن: لەساڵی ١٢٢/ ٧٤٠ زایینی مرد، عامر کوڕی عەبدوالله کوڕی زوبەیر کەدەڵێن: لەساڵی ١٢٢/ ٧٤٠ زایینی یا لەساڵی ١٢٤/ ٧٤٠ زایینی لەشام، مرد. محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی حەییان لەتەمەنی ٧٤ ساڵی لەمەدینە، یەعقوب کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەشەج کە لەشەڕ لەگەڵ رۆمیەکان کوژرا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و دووی کۆچی (( ٧٤٠ زایینی ))

### کوژرانی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب

لەم ساڵەدا، زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوژرا. هۆکاری مانەوەی ئەو لەکوفە پێشتر باس کرا و ئاماژەمان بۆ چۆنیەتی بەیعەت وەرگرتنی ئەو کرد.

کاتێك فەرمانی دەستپێکردنی بزوتنەوەکەی بەهاوەڵانی خۆیدا و ئەو کەسانەی بەیعەتیان کردبوو، دەیانویست بەبەڵێنەکەیان ئەمەکدار بن، دەستیان بەخۆ ئامادە کردن کرد. سلێمان کوڕی سوراقەی بارقی ڕۆشتە لای یوسف کوڕی عومەر و ئەوی ئاگادار کردەوە. یوسف چەند کەسێکی بەدوای زەیدا ڕەوانە کرد بەلام ئەویان نەدۆزییەوە. زەید لەگرتن ترسا، بەناچاری پەلەی کرد و پێش کاتی دیاریکراو لەگەڵ خەڵکانی کوفە، بزوتنەوەکەی دەست پێکرد. فەرمانداری کوفە لەم کاتەدا حەکەم کوڕی سەڵت و فەرماندەی پاسەوانەکانی عەمرۆ کوڕی عەبدولرەحمان لەقارە بوو. عوبەیداللە کوڕی عەباسی کێندی و چەندین کەس لەخەڵکانی شام هاورێیەتیان دەکرد. یوسف کوڕی عومەر لەحیرە دەژیا. کاتێك هاوەڵانی زەید کوڕی عەلی بینیان یوسف کوڕی عومەر لەکارەکانی زەید ئاگادار بۆتەوە و لەئێستادا بەشوێن ئەودا دەگەڕێت، دەستەیەك لەگەورەکانیان ڕۆشتنە لای زەید و وتیان: خواوەند لێت خۆش بێت، سەبارەت بەئەبووبەکر و عومەر چی دەڵێیت؟ دەیانویست زەید ئەم دووانە نفرین بکات تا خەڵك لێی دوور بکەونەوە یا جوێنی پێنەدات کەخۆی دەبووە هۆی بلاوبوونەوەی ئەوان لەدەروی زەید. زەید وتی: خواوەند لەهەر دووکیان خۆش بێت و بەهەشت بکاتە جێگەیان. لەکەسانی بنەماڵەکەی خۆم کەسم نەبینیوە خراپەی ئەم دووانە بێنێتە سەر زمان، هەموویان بەچاکی وەسفیان کردووە. ڕاشکاوانەترین وەلام کە بۆ پرسەکەی ئێوە، دەتوان بیدەمەوە ئەوەیە کە: ئێمە لەهەموو خەڵکان بۆ خەلافەت لەدوای پێغەمبەر(د.خ) شیاوتر بووین بەلام ئێمەیان لەو کارە دوورخستەوە. ئەم کارە نەبووە هۆی ئاژاوەنانەوە و ناباوەڕی ئێمە. ئەوان هاتنە سەرتەخت و لەسەر بنەمای نووسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەر(د.خ) هەڵس وکەوتیان کرد. وتیان: ئەگەر ئەوان ستەمیان لەتۆ نەکردووە،

خەلیفەکانی ئەمڕۆیش ستەمیان لەتۆ نەکردووە، بۆ داوا دەکەیت دژی ئەوان شەڕ بکەین؟ زەید وتی: ئەوان هاوشێوەی ئەبووبەکر و عومەر نین. ستەمکارن، هەم بۆمن هەم بۆ ئێوە. ئێمە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ بنەماکانی ئایینی ئیسلام و شێوازی پێغەمبەریان پێدەکەین و دەمانەوێت ڕێز لەباوەڕە ئیسلامییەکان بگرن و دیاردە تاز و قێزەونەکان نەهێننە کایەوە. ئەگەر فەرمانەکان جێبەجێ بکەن، بەختەوەریتان پێدەبڕێت و ئەگەر نەیکەن، من باوەڕپێکراوی ئێوە نیم. ئەوان خۆیان بەدوور گرت و بەیعەتەکەی خۆیان خستە ژێر پێ و وتیان: ڕێبەری ئێمە مردووە. مەبەستیان محەممەد کوڕی باقر بوو کەماڵئاوای لەجیهانی کردبوو. ئەمڕۆ جەعفەری کوڕی پێشەوا و ڕێبەری ئێمەیە. زەید ئەوانی بەبلاوەبووەکان ((لەجیاتی شوێنکەوتەکان)) ناوبرد کە بەعەرەبی پێیان دەوتریت رافزی. دەستەیەك گومان دەکەن، موغەیرە کوڕی سەعد ئەوانی بەرافزی ناو برد لەبەر ئەوەی لەدەوری ئەو بلاوەیان لێکرد.

دەستەیەك پێش ڕۆشتن بۆ لای زەید، ڕۆشتنە لای جەعفەر کوڕی محەممەدی سادق و ئەویان لەبەیعەتی خۆیان لەگەڵ زەید ئاگادار کردەوە. وتی: بەیعەتی لەگەڵ بکەن چوونکە گەورە و ڕێزداری ئێمەیە. گەڕانەوە و ئەم قسەیان لای کەس باس نەکرد. زەید بەڵێنی بەشوێنکەوتەکانی خۆیدا بوو لەشەوی یەکی سەفەر/ ٦ ژانویەی ٧٤٠ زایینی بزوتنەوەکەیان دەستپێکەن. یوسف کوڕی عومەر لەم کارە ئاگادار بوویەوە. کەسی بۆ لای حەکەم کوڕی سەڵت ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا خەڵکی کوفە لەناو مزگەوت کۆبکاتەوە و لەوێ دەستبەسەریان بکات. حەکەم خەڵکی بردە ناو مزگەوتەکە و ڕێگەی هاتنەدەرەوەی لێگرتن. لەماڵی معاویە کوڕی ئیسحاق، بەدوای زەیددا دەگەڕان. ئەو شەوانە لەوێ ڕۆشت. قامیشیان ئاگر تێبەردا و هاواریان دەکرد: ئەی ڕزگار کەری خەڵکان. ئەوەندە هاواریان کرد تا بەرەبەیان هەلات. کاتی بەرەبەیان، زەید، قاسمی توبەعی حەزرەمی لەگەڵ دوکەسی دیکە لەهاوەلانی خۆی ڕەوانە کرد کەدروشمەکەی ئەوان بەهاواری بەرزی خۆیان ئاشکرا بکەن. ئەم دووانە گەیشتنە بیابانی عەبدقەیس و چاویان بەجەعفەر کوڕی عەباسی کێندی کەوت و هێرشیان کردە سەر خۆی و هاوەلانی. ئەوەی لەگەڵ قاسمی توبەعیدا بوو، کوژرا و قاسم بریندار و ئەویان بردە لای حەکەم کوڕی سەڵت و سەریان بڕی. ئەم دووانە یەکەم کەس لەهاوەلانی زەید بوون، کوژران.

حەکەم دەروازەکانی بازار و مزگەوتی لەسەر خەڵکان داخست.

حەکەم کوڕی سەڵت کەسی بۆ لای یوسف کوڕی عومەر لەحیرە ڕەوانە کرد و لەباس و خواسەکان ئاگاداری کردەوە. یوسف، جەعفەر کوڕی عەباسی کێندی ڕەوانە کرد تا هەواڵە ڕاستەکانی بۆ بێنێت. جەعفەر لەگەڵ پەنجا سوار بەرێکەوت تا گەیشتە دەشتی سالم. لەچۆنیەتی بارودۆخی پرسی و بۆ لای یوسف گەڕایەوە و هەواڵەکانی پێڕاگەیاند. ڕەییان کوڕی سەلەمەی ئەرانی لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد. سێسەد تیرهاوێژ لەپیادەکانی قیقانییە، هاوڕێیەتیان دەکرد.

زەید شەوی کردە ڕۆژ و هەموو ئەو کەسانەی لەو شەوەدا پەیوەستی بوون دوسەد و هەژدە کەس بوو. وتی: پەنا بەخوا! خەڵك لەکوێن؟ وتیان: لەمزگەوتی شار گەمارۆیان خراوەتە سەر. وتی: سوێند بەخوا ئەمە بۆ ئەو کەسانەی بەیعەتیان لەگەڵ ئێمە کردووە، بیانوێکی گونجاو نییە. نەسر کوڕی خەزیمەی عەبسی دەنگی ئەوی بیست و ڕووی تێکرد. لەڕێگا چاوی بەعەمرۆ کوڕی عەبدولرەحمان سەرکردەی پاسەوانەکانی حەکەم کوڕی سەڵت لەگەڵ سوارەکانی لەجەهینە، کەوت. نەسر وهاوەڵانی هێرشیان کرد و عەمرۆ کوڕی عەبدولرەحمان کوژرا و سوپاکەی بڵاوەیان لێکرد. زەید بەرەو دەشتی سالم بەرێکەوت و گەیشتە دەشتی ڕاوچییەکان کەپێنسەد کەس لەخەڵکانی شام لەوێ بوون. خۆی و هاوەڵانی هێرشیان کردە سەر خەڵکانی شام و شکستیان پێهێنان. زەید گەیشتە ماڵی ئەنس کوڕی عەمرۆ ئەزدی. ئەنس یەکێك بوو لەو کەسانەی بەیعەتی لەگەڵ زەید کرد بەڵام لەماڵەوە دانیشت. بانگی کرد و کەس وەڵامی نەدانەوە. زەید بانگی کرد بەڵام وەڵامی دەستنەکەوت. وتی: بۆ پاشەکشێتان کرد؟ بەمەبەستی خۆتان گەیشتن؟ خواوەند سزای کارەکانتان بداتەوە! دواتر زەید ڕووی کردە کەناسە و هێرشی کردە سەر سوپای خەڵکانی شام و شکستی پێهێنان. زەید لەگەڵ دوسەد پیاوی شەڕکەر بەرێکەوت و یوسف سەیری دەکرد. ئەگەر هێرشی دەکردەسەر، لەناوی دەبرد. ڕەییان و خەڵکانی شام لەکوفە بەدوای زەید و شوێنکەوتەکانی دەگەڕان. زەید ڕووی کردە نوێژگەی خالید و لەوێوە ڕۆشتە ناو کوفە. دەستەیەك لەهاوەڵانی ڕوویان لەدەشتی موخەنەف کوڕی سەلیم کرد و لەوێ ڕوبەڕووی شامییەکان بوونەوە. شامییەکان یەکێك لەهاوەڵانی زەیدیان ئەسیر و یوسف کوڕی عومەر فەرمانی سەربڕینی ئەویدا.

کاتێك زەید زانی، چیتر خەڵکان هاوکاری ناکەن، وتی: ئەی نەسر کوڕی خەزیمە، دەترسم، ئەو کارەی لەگەڵ حسەین کردیان، لەگەڵ منیش بیکەن. نەسر وتی: من، سوێند بەخوا شان بەشانی تۆ شەڕ دەکەم تا گیان دەبەخشم. خەڵکان لەمزگەوتن. بۆ لای ئەوان بڕۆین. عوبەیداللە کوڕی عەباسی کەمەندی، لەبەر دەرگای عومەر کوڕی سەعد رووبەرویان بوویەوە و شەڕ دەستی پێکرد. عوبەیداللە و هاوەڵانی بلاوەیان لێکرد. زەید بەریکەوت تا گەیشتە مزگەوت. هاوەڵانی بەردەوام لەسەر بانەوە ئاڵاکانیان دەبردە ناو مزگەوتەکە و دەیانوت: ئەی خەڵکانی ناو مزگەوت، خۆتان لەریسوایی رزگار بکەن، پشت بکەنە جیهان و باوەش بۆ ئەو دنیا بکەنەوە، ئێوە نە دینتان هەیە نا پاشاکانی ئەم جیهانەن! خەڵکانی شام ئەوانیان بەردباران کرد.

رەییان لەکاتی ئێوارێ بۆ حیرە گەڕایەوە و زەید و هاوەڵانی گەڕانەوە. کەسانێك لەخەڵکانی کوفە پەیوەستی بوون. زەید لە((رۆژی خانە)) دابەزی. رەییان کوڕی سەلمە هێرشی کردەسەرو لەو رۆژی خانە شەڕی لەگەڵ کرد. ژمارەیەکی فراوان لەخەڵکانی شام و کوفە بریندار بوون. سوپای شامییەکان لەنێوارێی رۆژی چوارشەممەن بەشێوەیەکی تێکشکاو، بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە.

بۆ بەیانی، یوسف کوڕی عومەر، عەباس کوڕی سەعیدی موزنی وەك سەرکردەی سوپای خەڵکانی شام دەستنیشان و بۆ شەڕی زەید ڕەوانەی کرد. لەرۆژی خانە رووبەرووی بوویەوە. زەید خۆڕاگری کرد. فەرماندەی باڵی چەپ و راستی سوپاکەی، معاویە کوڕی ئیسحاق کوڕی زەید کوڕی سابت و نەسر کوڕی خەزیمە بوون. شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد و نابل کوڕی فەروەی عەبسی لەخەڵکان شم، هێرشی کردە سەر نەسر کوڕی خەزیمە و بەشمشێر لێیدا و رانی قرتاند. نەسر کەوتە سەرزەوی. نەسر، بەهەمان شێوە بەشمشێر لێیدا و ئەوی کوشت. زۆری نەخایاند نەسر مرد و شەڕ رووی لەدژواری کرد. هاوەڵانی عەباس شکستیان خوارد و نزیکەی حەفتا کەس لەوان کوژرا.

بۆ ئێوارێ، یوسف کوڕی عومەر، دووبارە ئەوانی بۆ شەڕ رێکخستەوە و بۆ شەڕی زەید، ڕەوانەی کردن. زەید و سوپاکەی هێرشیان کردنەسەر و تا سوێرەڵان، پاشەکشێیان بەسوپای شامییەکان کرد. لەسوێرەڵان، پەلاماریاندان و بۆ شوێنی مانەوەی مناڵەکانی سەلیم، دووریان خستنەوە. سوارەکانی سوپاکەی عەباس، نەیانتوانی لەبەرابەر سوارەکانی

زەید خۆڕاگری بکەن. عەباس کەسی بۆ لای یوسف ڕەوانە کرد و پێی وت: زوبین هاوێژەکان ڕەوانە بکە. یوسف، ئەوانی بۆ هاوکاری عەباس ڕەوانە و دەستیان بەتیرباران کردنی سوپاکەی زەید کرد. معاویە کوڕی ئیسحاقی ئەنساری بووێرانە لەبەردەم زەید شەڕی دەکرد تا کوژرا. زەید کوڕی عەلی و پاشماوەی سوپاکەی تا کاتی شەو خۆڕاگریان کرد. تیرێك بەر لای چەپی روخساری زەید کەوت و لەمێشکی چەقی. هاوەڵانی زەید گەڕانەوە و سوپاکەی شام گومانیان کرد تەنیا لەبەر شەو پاشەکشێیان کردووە. زەید لەیەکێك لەماڵەکانی ئەرحەب دابەزی و پزیشکیان هێنا. پزیشك، تیرەکەی دەرهێنا، زەید لەتاو ئازار هاواری دەکرد و کاتێك، تامی فریو و ئازاری چێشت، چاوی لەدنیا بەست. هاوەڵانی وتیان: چیبکەین و لەکوێ بەخاکی بسپێرین؟ یەکیان وتی: بیخەینە ناو روبار. یەکی دیکە وتی: سەری ببڕین و لاشەی بخەینە ناو کوژراوەکان. یەحیای کوڕی وتی: سوێند بەخوا بەرەوای نازانم، سەگەکان گۆشتی باوکم بخۆن. یەکی دیکە وتی: لەچاڵێکدا بەخاکی دەسپێرین کەگڵی لێهەڵدەگرن و دواتر ئاو دەکەینە سەری. ئەو کارەیان کرد و کاتێك ئەویان بەخاك سپارد، ئاویان کردە سەر چاڵەکە. دەستەیەك دەڵێن: ئەویان لەرووباری یەعقوب بەخاك سپارد و دواتر، هاوەڵانی ئاویان کردە ژێر گۆڕەکەی. زەید کۆیلەیەکی بوو بەناوی سندی کەئەوی بینی و خەڵکانی ئاگادار کردەوە. خەڵك لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد. کوڕەکەی بەرەو کەربەلا بەرێکەوت و لەنەینەوا دابەزی. بوو بەمیوانی سابق کۆیلەی بیشر کوری عەبدولەلیك.

یوسف کوڕی عومەر بەدوای برینداره‌کاندا گەڕا و ماڵی یەکی یەکی ئەوانی پشکنی. سندی کۆیلەکەی زەید، لەرۆژی هەینی، ڕێگەی گۆڕەکەی زەیدی نیشاندان. ئەویان لەگۆڕ دەرهێنا و سەری بڕی و بۆ یوسف کوڕی عومەریان ڕەوانە کرد. حەکەم کوڕی سەڵت سەرەکەی نارد. یوسف کوڕی عومەر فەرمانیدا و ئەویان لەکەناسە هەڵواسی. بەهەمان شێوە ئەو کارەی لەگەڵ سەری نەسر کوڕی خەزیمە و معاویە کوڕی ئیسحاق کرد و پاسەوانی بۆ دانان. دواتر سەری ئەوی بۆ هوشام لەشام ڕەوانە کرد. هوشام، سەری زەیدی لەدەروازەی دیمەشق هەڵواسی و دواتر بۆ مەدینەی نارد. جەستەکەی بەدارەوە بوو تا ئەو کاتەی هوشام کوڕی عەبدولەلیك مرد و وەلید هاتە سەرکار. وەلید فەرمانی داگرتن و سوتاندنی جەستەکەی دەرکرد. دەستەیەك دەڵێن: خەراش کوڕی حەوەشب کوڕی یەزیدی

شەیبانی فەرماندەی پاسەوانەکانی زەید بوو. ئەو بوو گۆڕەکەی هەڵدایەوە و جەستەکەی دەرهێنا و دواتر لەداریدا. سەییدی حەمەوی دەڵێت:

بت لیلا مسهدا      ساهر العین مقصدا

و لقد قلت قولة      و اطلت التلبدا

لعن الله حوشبا      و خراشا و مزیدا

و یزیدا فانه      کان اعتی و اعتدا

الف الف انف الـ      ـه و آذوا محمدا

شرکوا فی دم المطهـ      ـرقوانة زید تعندا

ثم عالوه فوق جذ      ع صریعا مجردا

یا خراش بن حوشب      انت اشقی الوری غدا

یانی: شەوێکی دژوارم بەسەر برد بێ ئەوەی بۆ یەك سات پێڵووەکانم لەگەڵ یەك میهرەبان بن. چاوەکانم کراوە و ئازار لەقوڵایی گیانم. وتەیەکم هێنایە سەرزمان و بیرم کردەوە و تێرامام. خواوەند نفرینی حەوەشب و خێراش و مەزید و یەزید، چوونکە ستەمکار و یاخی بوون. هەزار جار نفرینیان لێ بێت بۆ هەمیشە. ئەوان شەڕیان لەگەڵ خوا کرد و محەممەدەیان ڕەنجاند. بۆ تۆڵەسەندنەوەی لەخواردنەوەی خوێنی پاکی زەید بوونە شەریك و دواتر خوێناوی و رووت جەستەی ئەویان هەڵواسی. ئەی خێراش کوڕی حەوەشب، تۆ بەدبەختترین خەڵکان لەرۆژی هەستانەوەیت.

داستانی کارەکان و شەڕی یەحیا کوڕی زەیدیان بەشێوەیەکی دیکەیش گێڕاوەتەوە. دەڵێن: کاتێك، زەید کوژرا، پیاوێك لەمناڵەکانی ئەسەد پێی وت: خەڵکانی خوراسان شوێنکەوتەی ئێوەن. باشترە بەرەو ئەو دیارە بەرێکەویت. وتی: چۆن دەتوانم؟ وتی: لەشوێنێك خۆت حەشار بدە تا بارودۆخ ئارام ببێتەوە و ئەوسا بەرەو خوراسان بەرێکەوە. شەوێك ئەوی لای خۆی هێشتەوە بەڵام دواتر ترسا و ڕۆشتە لای عەبدولمەلیك کوڕی بیشر کوڕی مەروان و پێی وت: تۆ کەسێکی پەیوەندی خزمایەتیت لەگەڵ زەید هەیە و مافی لەملی تۆدایە. وتی: بەڵێ، لێخۆش بوون لەخۆپارێزی و خواپەرستییەوە نزیکترە. وتی: زەید کوژراوە بەڵام کوڕێکی دوای خۆی بەجێهێشتوە و هیچ تاوانێکی نییە. ئەگەر یوسف بەشوێنەکەی بزانێت، دەیگرێت و دەیکوژێت، ئایا لای خۆت

پارێزگاری لێدەکەیت؟ وتی: بەڵێ. یەحیا کوڕی زەید ڕۆشتە لای ئەو و لەماڵەکەی ئەودا مایەوە. کاتێک، بارودۆخ، هێور بوویەوە، لەگەڵ دەستەیەک لەشوێنکەوتەکانی خۆی وباوکی مەبەستی ڕۆشتن بۆ خوراسانی کرد. یوسف کوڕی عومەر دوای کوژرانی زەید تورە و وتی: ئەی خەڵکی عێراق، یەحیا کوڕی زەید لەناو پەردەی ژنەکانی ئێوە دەسوڕێتەوە بەهەمان شێوە کەباوکی دەسوڕایەوە. سوێند بەخوا ئەگەر بیبینم، گوونی دەردەهێنم بەهەمان شێوە کەئەو کاردم لەگەڵ باوکی کرد! ئەوانی ترساند و سەرکۆنەی کردن. چیتر کەس شوێن یەحیا نەکەوت.

## کوژرانی بەتاڵ

لەم ساڵەدا بەتاڵ کوژرا. ناوی عەبدوالله باوکی حسەینی ئەنتاکییە. ئەو، هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەک لەموسوڵمانان لەسەرزەمینی ڕۆم کوژرا. دەستەیەک دەڵێن: ئەم ڕووداوە لەساڵی ١٢٣/ ٧٤١ زایینی ڕوویدا. ئەو چەندین جار شەڕی لەگەڵ ڕۆمییەکان کرد و هێرشی کردە سەر شارەکانی ئەوان. ڕۆمییەکان بەردەوام لێی دەترسان.

دەگێڕنەوە: جارێک لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ڕووی کرد ڕۆم و شەوانە ڕۆشتە ناو گوندێک. ژنێک بەمناڵە بچووکەکەی خۆی دەوت کەدەگریا: بێدەنگ بە وەگەرنە بەتاڵت بۆ بانگ دەکەم. دواتر مناڵەکەی بەرز کردەوە و وتی: بەتاڵ وەرە بۆی. بەتاڵ مناڵەکەی لەدەست گرت.

عەبدولمەلیک ئەوی لەگەڵ کوڕەکەی خۆی بۆ ڕۆم ڕەوانە کرد. ئەوی کردە سەروەر و هەڵبژێردراوانی شام و جەزیرە و فەرمانی بەکوڕەکەیدا فەرماندەیی پێشەنگەکانی خۆی بەو بسپێرێت. پێی وت: بەتاڵ، پیاوێکی بوێر و دلێرە. مەسلەمە ئەوی کردە فەرماندەی دەهەزار سوارکاری شەڕکەر. ئەو لە نێوان مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیک و ڕۆمییەکان، کاروباری تایبەت بەسنورەکانی رادەپەڕاند. جوتیار و بازرگانەکان بەئاسوودەی وبێ ترس هاتوچۆیان دەکرد. جارێک سوپای موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی ڕۆم. کاتێک لەسنورەکان تێپەڕین و لەو دیارە نزیک کەوتنەوە، بەتاڵ بەتەنیایی پێشڕەوی کرد. سەوزەڵانێکی بینی، دابەزی و سەوزەی خوارد. سکی ئاوسا و تووشی بەلەفیرە بوو. ترسا ئەم نەخۆشیەی لەناوی ببات. سوار بوو و بەهەمان شێوە پێشڕەوی کرد. دەترسا

لەئەسپەکەی دابەزێت لەبەر ئەوەی نەکا نەتوانێت دووبارە سوار ببێتەوە. لاوازی بەسەریدا زاڵ و دەستی کردە گەردنی ئەسپەکەی. بەرێکەوت و نەیزانی لەکوێیە و ئەسپەکەی ئەوی دەبرد. چاوی کردەوە و بینی لەخانەقایەکی مەسیحیدایە و ژنان دەوریان گرتووە. یەکێك لەوان لەئەسپەکەی هێنایە خوار و شۆردی. دەزمانێکی دەرخواردا و بووە هۆی وەستانی بەلەفیرەکەی. سێ رۆژ لەو خانەقایە مایەوە. دواتر بەتریقێك هاتە ناو خانەقاکە و خوازبێنی لەو ژنە کرد و لەهاتنی بەتاڵ ئاگادار بوویەوە. ژن ئەوی لەماڵێکدا شاردبوویەوە و پارێزگاری لێدەکرد. بەتریق خانەقاکەی بەجێهێشت و درێژەی بەرێگەی خۆیدا. بەتاڵ سەرکەوت و شوێن بەتریق کەوت و کوشتی. بۆ خانەقاکە گەڕایەوە و سەری بەتریقی خستە بەردەم پێی ژنەکان. ژنەکانی هەڵگرت و بۆ لەشکرگەی موسوڵمانان گەڕایەوە. فەرماندەی سوپاکە، ئەو ژنەی بەبەتاڵ بەخشی کەبووە دایکی منداڵەکانی بەتاڵ.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

دەڵێن: لەم ساڵەدا کولسوم کوڕی عەییازی قوشەیری کوژرا. کاتێك ئاژاوە لەناو بەربەرییەکان سەری هەڵدا، هوشام ئەوی لەگەڵ دەستەیەك بۆ ئەفریقییە ڕەوانە کرد. لەم ساڵەدا فەزل کوڕی ساڵح و محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەلی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هەروەها لەم ساڵەدا یوسف کوڕی عومەر، کوڕی شیبرەمەی کردە فەرمانڕەوای سیستان و ئەو، محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی باوکی لەیلی وەك سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەو شارە هەڵبژارد.

محەممەد کوڕی هوشامی مەخزومی لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. فەرمانداری شارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون. دەستەیەك دەڵێن: فەرمانداری موسڵ، باوکی قوحافە کوڕی برای وەلید کوڕی تەلیدی عەبسی بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەییاس کوڕی معاویە کوڕی قورە دادیاری بەسرە ناسراو بە زیرەکی و وشیاری بێ هاوتا. زەید کوڕی حارسی یامی، ئەبووبەکر کوڕی محەممەد کوڕی مەکندەر کوڕی عەبدوالله تیمی تیم قورەیش کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٠/ ٧٤٨ زایینی یا ١٣١/ ٧٤٩ زایینی چاوی لەدنیا بەست. یەزید کوڕی عەبدوالله کوڕی قیست و یەعقوب کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەشەج.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و سێی کۆچی (( ٧٤١ زایینی ))

## ئاشتی نەسر کوڕی سەیار لەگەڵ خەڵکانی سەغد

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی سەیار لەگەڵ خەڵکانی سەغد پەیمانی ئاشتی بەست.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو: کاتێك خاقان لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەسەد کوژرا، تورکەکان دەستیان بەکوشتاری یەك و بڵاوەیان لێکرد. لەبەر ئەمە سەغدییەکان چاوی تەماحیان بڕییە گەڕانەوە بۆ وڵات و دیاری خۆیان و دەستەیەك لەوان پەیوەستی چاچییەکان بوون. کاتێك نەسر کوڕی سەیار هاتەسەرکار، کەسانێکی بۆ لای ئەو ڕەوانە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیانی پێکردن. داوای هەرچییان دەکرد، نەسر پێی ڕازی بوو. ئەوان خوازیاری ئەو مەرجانە بوون کەفەرمانڕەوای خوراسان پێیان ڕازی نەدەبوو. وەك ئەوەی ئەو کەسانەی لەئایینی ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە، سزا نەدرێن، کەس نەتوانێت وەك خاوەن قەرز ئەوان بباتە دادگا و ئەسیرە موسوڵمانەکان تەنیا بەفەرمانی دادیار و شایەتی شایەتەکان لەوان وەربگیرێتەوە. خەڵك بۆ ڕازی بوون بەم مەرجانە ڕەخنەیان لەنەسر کوڕی سەیار گرت و لەم بارەوە گفتوگۆیان کرد. نەسر وتی: ئەگەر هاوشێوەی من دەتانبینی ئەوان لەناو موسوڵمانەکان چۆن دەبنە هۆکاری شکۆداری، بۆ ئەم کارە، هیچ کات ڕەخنەتان لەمن نەدەگرت. سەبارەت بەم کارە نێردراوێکی بۆ لای عەبدولمەلیك کوڕی هوشام ڕەوانە کرد. عەبدولمەلیك کارەکەی ئەوی پشتڕاست کردەوە.

## مردنی عوقبە کوڕی حەجاج و هاتنی بەلج بۆ ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عوقبە کوڕی حەجاجی سەلوولی فەرمانداری ئاندۆلۆس مرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو خەڵکانی ئاندۆلۆس دژی ئەو ڕاپەڕین و ئەوویان لەسەر کار لابرد و عەبدولمەلیك کوڕی قەتەنیان هێنایە سەرکار. ئەم دووەمین جاری فەرمانداری ئەو بوو کە لەمانگی سەفەری ئەم ساڵە، ژانویەی ٧٤١ زایینی، جڵەوی کارەکانی گرتەدەست. بەربەرییەکان لەئەفریقییە ئەو کارانەیان ئەنجام دەدا کە لەکاتی باس کردنی ڕووداوەکانی ساڵی ١١٧/ ٧٣٥ زایینی، ئاماژەمان پێدا. ئەوان بەڵج کوڕی بیشر عەبسیان لەشارەکەی خۆی، دەورەدا تا ئەوەی بارودۆخیان لەخۆی و هاوەڵانی دژوار کرد. بازنەی گەمارۆکە سات بەسات زیاتر تەنگی پێهەڵدەچنین. ئەوان تا ئەم ساڵە خۆڕاگریان کرد. ئەو نێردراوێکی بۆ لای عەبدولمەلیك کوڕی قەتەن ڕەوانە و داوای کرد کەشتیەکانی

بۆ ڕەوانە بکات تا لەگەڵ خۆی و هاوەڵانی لەرێگەی دەریاوە بەرەو ئاندۆلۆس بڕوات. ئاماژەی بەگرفتارییەکانی خۆیدا بەشێوەیەك کەناچار بوون گۆشتی چوارپێکانی خۆیان بخۆن. عەبدولمەلیك رازی نەبوو رێگەیان بدات بڕۆنە ناو ئاندۆلۆس. بەڵێنی پێدان هێزی پشتیوانیان بۆ ڕەوانە دەکات بەڵام بەڵێنەکەی خۆی نەبردە سەر.

بەربەرییەکان لەئاندۆلۆس بەهێز و عەبدولمەلیك ناچار بوو بەڵج و هاورێکانی لەشارەکەی خۆی جێگە بکاتەوە. دەستەیەك دەڵێن: عەبدولمەلیك لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد تا رێگە بدەن بەلج بێتە ناو شارەکەیان بەڵام ئەویان لەدەرئەنجامەکانی ئەم کارە ترساند. وتی: دەترسم، سەروەری باوەڕداران بڵێت: سوپاکەی منت بەرەو لەناوچوون برد. مۆڵەتی ئەو کارەی پێدان و پەیمانی لێوەرگرتن تەنیا یەك ساڵ لەئاندۆلۆس بمێننەوە و دواتر، بۆ ئەفریقییە بگەڕێنەوە. ئەوان رازی بوون و بارمتەیان لادانا.

کاتێك گەیشتنە ئاندۆلۆس، عەبدولمەلیك و موسوڵمانەکان بینیان ئەوان چەندە گرفتاری برسییەتی و نەهامەتییەکانی رۆژگار بوون چوونکە رۆژگارێکی درێژ، گەمارۆیان لەسەر بوو. ئەوانیان پۆشاند و چاکەیان لەگەڵ کردن. هێرشیان کردە سەر دەستەیەك لەبەربەرییەکان و شەڕیان لەگەڵ تاقیکردنەوە و دەستی تاڵان کردنییان بۆ سەر مەروماڵاتەکانی ئەوان درێژ کرد. بەمشێوەیە هاوکاری بەلج و هاورێکانی ئەویان کرد. بەلج و سوپاکەی ئەسپ و چوارپێی تایبەت بەسوارییان دەستکەوت.

عەبدولمەلیك کوری قەتەن بۆ قەرتەبە گەڕایەوە و فەرمانی بەبەلج و هاورێکاندیا لەئاندۆلۆس بڕۆن. ئەوان رازی بوون و داوای کەشتیان کرد تا سواری بن بۆ ئەوەی ناچار نەبن لەرێگەی دوورگەی سەوزە بڕۆن و رووبەرووی بەربەرەکان ببنەوە کە لەهەموو قۆڵەکانەوە گەمارۆیان خستۆتە سەریان. عەبدولمەلیك بەم داواکارییە رازی نەبوو، وتی: من تەنیا لەدورگە، کەشتیم هەیە. وتیان: ناگەڕێینەوە چوونکە گرفتاری بەربەرییەکان دەبین. بەو رێگەدا ناڕۆن ئەوانی لێن چوونکە دەترسین لەناو سەرزەمینەکانی خۆیان کوشتارمان بکەن. عەبدولمەلیك پێداگری کرد تا بگەڕێنەوە. کاتێك بەمشێوەیان بینی، دژی ئەو ڕاپەرین و شەڕیان لەگەڵ کرد. توانیان بەسەر ئەودا سەرکەوتن بەدەست بێنن و ئەویان لەکۆشکەکەی دەرپەڕاند. ئەم رووداوە لەسەرەتاکانی زی قەعدەی ئەم ساڵە، نیوەکانی سێپتامبەری ٧٤١ زایینی روویدا.

کاتێك بەلج، توانی سەرکەوتن بەسەر عەبدولمەلیك بەدەست بێنێت، پێشنیاری کوشتنی ئەویان پێکرد. ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر. لەبەر تەمەنی زۆر، هاوشێوەی جوجکە بوو. ئەوی کوشت و بەدارەوە هەڵیواسی و فەرمانداری ئاندۆلۆسی گرتەدەست. ساڵەکانی ژیانی عەبدولمەلیك نەوەد ساڵ بوو. کوڕەکانی قەتەن و ئومەییە هەڵاتن. یەکێیان ڕۆشتە ماردە و ئەوی دیکەیان بۆ سارا گوسا. هەڵاتنی ئەم دووانە پێش کوژرانی باوکیان بوو. کاتێك باوکیان کوژرا، ئەو کارەیان کرد کەبەخواستی خوا، ئاماژەی پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی عومەر، حەکەم کوڕی سەڵتی لەگەڵ وەفدێك بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ دەرباری هوشام ڕەوانە و داوای لێکرد حەکەم وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان بکات. ئاماژەی بەتواناییەکان و کارە گەورەکانی ئەوی لەخوراسان بیر خستەوە. وتی: نەسر کوڕی سەیار پیاوێکی کاڵ و بێ ئەزموونە. هوشام کەسی بۆ میوانخانەکەی نارد و موقاتلی کوڕی سەعدی ئەزدی بانگ کرد. ئەو لەخوراسانەوە هاتبوو و سەد و پەنجا کەس لەتورکەکان هاوڕێیەتی ئەویان دەکرد. هوشام سەبارەت بەحەکەم کوڕی سەڵت پرسیاری لێکرد. دەیویست بزانێت لەخوراسان چی کردووە و چی ئەنجامداوە. موقاتیل کوڕی عەلی پێی وت: حەکەم بوو بەفەرمانداری گوندێك بەناوی فاریاب کەخەراجی ساڵانەکەی، حەفتا هەزار درەم بوو. حارس کوڕی سورەیج ئەوی ئەسیر کرد، گوێچکەی بادا و ئازادی کرد، پێی وت: لەوە ریسواتری، دەستم بەخوێنی تۆ پیس بکەم. هوشام، نەسر کوڕی سەیاری لەخوراسان لانەبرد.

لەم ساڵەدا، نەسر کوڕی سەیار، بۆ دووەم جار، رووی کردە فەرغانە. وەفدێکی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ عێراق نارد و سەرپەرەستی ئەوانی بەمەعن کوڕی ئەحمەری ئەمیری سپارد و پێی وتن برۆنە لای هوشام کوڕی عەبدولمەلیك. ئەو لای یوسف کوڕی عومەری تێپەڕی. یوسف پێی وت: ئەی کوڕی ئەحمەر، کاری ئێوەی خەڵکانی قەیس گەیشتۆتە شوێنێك کەئەم پیاوە دەست بڕاوە، کاروبارەکان لەدەستی ئێوە دەردێنێت! وتی: بەم شێوەیە. یوسف فەرمانی پێدا لای هوشام خراپەی نەسر بێنێتە سەرزمان و کارە

قێزمونەكانی ئەوی بیر بخاتەوە. وتی: بەخششەكانی ئەو بەردەوام من و كەسانی بنەماڵەكەم دەگرێتەوە، چۆن بتوانم خراپەی ئەو باس بكەم؟ یوسف پێداگری كرد. مەعن كوڕی ئەحمەر وتی: ئاماژە بەكام كارە قێزمونەی بدەم؟ ئەزمونەكەی، فەرمانبەری، پاكی و سرشت پاكی یا ولأتداری؟ وتی: ڕەخنە لەپیری ئەو بگرە.

كاتێك ڕۆشتە لای هوشام، ئاماژەی بەسوپای خوراساندا و بەهێزی و گوێرایەڵی سوپاكەی وەسف كرد و وتی: هەموو شتێك باشە، جگە لەوەی سوپاكە، فەرماندەیەكی شیاوی نییە. هوشام وتی: هاوار لەتۆ! ئەی كەنانی (نەسر كوڕی سەیار) چی بەسەر هاتووە؟ وتی: بەهێز و فرەزانە بەلأم خەڵكان ناناسێت و دەنگی ئەوان نابیستێت تا ئەو كاتەی بەتەواوی لەو نزیك دەبنەوە. ئەگەری هەیە لەبەر پیری، هەست بەشتە بچوكەكان نەكات و ئەمە لەبەر ئەوەیە ساڵەكانی تەمەنی درێژ بۆتەوە. شەبیل كوڕی عەبدولرەحمانی مازنی پێی وت: سوێند بەخوا، درۆ دەكات. نەپیرە كەخڵەفاو بێت، نەگەنجە كە بۆ كارە گەنجانەكانی ڕەخنەی لێبگرن، بەڵكو پیاوێكی تەمەن ناوەند و بەئەزموونە كەپارێزگاری هەموو سنورەكانی خوراسان دەكات و پێش ئەوەی فەرمانڕەوایەتی بگرێتەدەست، بەشداری هەموو شەڕەكانی كردووە. هوشام هەستی كرد كەوتەكانی مەعن كوڕی ئەحمەر لەهەڵخراندنی یوسف كوڕی عومەر سەرچاوەی گرتووە. سەیری نەكرد.

مەعن بۆ لای یوسف گەڕایەوە. داوای لێكرد كوڕەكەی لەخوراسانەوە بۆ ئەو دیارە بگەڕێنێتەوە. ئەو كارەی كرد. مەعن كەسی نارد و بنەماڵەكەی خۆی گەڕاندەوە. كاتێك نەسر كوڕی سەیار ڕۆشتبووە خوراسان، مەعنی هەڵبژارد و پێگەی ئەوی بەرز كردەوە و دەستی ئەوی بۆ ئەنجامدانی كارەكان، ئاوەڵا كرد. كاتێك ئەم كارەی كرد، نەسر خەڵكانی قەیسی لەخۆی دوورخستەوە. ئەوان ڕۆشتنە لای و داوای لێخۆشبوونیان كرد.

لەم ساڵەدا هوشام كوڕی عەبدولمەلیك ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا. فەرمانداری شارەكان، هەمان كەسانی ساڵی پێش بوون.

ئەم كەسانە لەم ساڵەدا مردن: محەممەد كوڕی واسعی ئەزدی بەسری كەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی مرد. سابتی بەنانی كەدەڵێن: لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی و لەتەمەنی ٨٦ ساڵیدا مرد، سەعید كوڕی باوكی سەعیدی كیسانی موقەری كەدەڵێن: لەساڵی ١٢٥ یا ١٢٦/ ٧٤٣ یا ٧٤٤ زایینی مرد، مالك كوڕی دیناری خواپەرەست.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و چواری کۆچی ((٧٤٢ زایینی))

## سەرەتای کاری ئەبوو موسلمی خوراسانی

خەڵکان سەبارەت بەبەسەرهاتی ئەبوو موسلیم بەشێوەیەکی جیاواز قسەیان کردووە. دەڵێن: پیاوێکی ئازادە بەناوی ئیبراهیم کوڕی عوسمان کوڕی بەشار کوڕی سەدووس کوڕی گودەرزە لەمناڵەکانی بووزرگمێهری فرمزان کەنازناوەکەی باوکی ئیسحاقە. لەئیسفەهان چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەکوفە گەورە بوو. باوکی سەرپەرەستی سامان و بنەماڵەکەی خۆی بە عیسا کوڕی موسای سەراج سپارد. عیسا لەتەمەنی حەوت ساڵی ئەوی بردە کوفە و کاتێك چاوی بەئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس کەوت، پێی وت: ناوی خۆت بگۆڕە چوونکە بەپێی ئەوەی لەنوسراوەکاندا خوێندوومە و بینیومە، کاروبارەکانی ئێمە تەنیا لەسەر دەستی تۆ سامان دەدرێت. ئەو ناوی خۆی بۆ ئەبوو موسلیم عەبدولرەحمان کوڕی موسلیم گۆڕی و درێژەی بەرێگەکەی خۆیدا. قژی پەرێشان و درێژ بوو. کۆپانی خستبووە سەر کەرێك و سواری ببوو. لەم کاتە نۆزدە ساڵ لەتەمەنی تێپەڕیبوو. ئیبراهیم، کچی عیمران کوڕی ئیسماعیلی تایی ناسراو بەناوی باوکی نەجمی وەك هاوسەری ئەو هەڵبژارد. کچ، لەگەڵ باوکی لەخوراسان دەژیا. ئەبوو موسلیم لەخوراسان لەگەڵی خەوت. ئەو کچەکەی خۆی کردە هاوسەری موحریز کوڕی ئیبراهیم و کچەکەی دیکەی بەناوی ئەسماء کردە هاوسەری فەهم کوڕی موحریز. ئەسماء مناڵی هێنایە دنیا بەڵام فاتیمە مناڵی نەبوو. فاتیمە ئەو کەسەیە کە ((خوڕەم دینەکان)) باسی دەکەن.

سلێمان کوڕی کسیر و مالك کوڕی هەیسەم و لاهیز کوڕی قورەیز و قەحتەبە کوڕی شەبیب لەخوراسانەوە بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ مەککە بەرێکەوتن. ئەم ڕووداوە لەساڵی ١٢٤/ ٧٤٢ زایینی ڕوویدا. کاتێك ڕۆشتنە ناو کوفە، لەزیندان، سەردانی عاسم کوڕی یونسی عیجلیان کرد. ئەویان بەتاوانی هاندانی خەڵك بۆ شوێنکەوتنی بنەماڵەی عەباس زیندانی کردبوو. عیسا کوڕی مەعقەلی عیجلی و ئیدریس کوڕی مەعقەلی عیجلی لەگەڵ ئەو، زیندانی کران. ئیدریس، باوەگەورێی ئەبوو دولفی عیجلییە. یوسف کوڕی عومەر ئەم دووانەی لەگەڵ چەند کەسێك لەکارگوزارەکانی خالیدی قەسری زیندانی کردبوو. ئەبوو موسلیم کەپەیوەستی ئەم دووانە ببوو، خزمەتی ئەوانی دەکرد. ئەوان، نیشانەکانی گەورەییان لەئەبوو موسلیم بینی و وتیان: ئەم گەنجە کێیە و چ کارەیە؟ وتیان: کوڕێك

لەپیشەگەرانی زین دروست کەرە و خزمەتی ئێمە دەکات. ئەبوموسلیم قسەکانی ئەوان دەبیست و دەگریا. کاتێك ئەویان بینی، پێشنیاری باوەڕ و بۆچونەکی خۆیانیان پێکرد. ئەبوموسلیم رازی بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەو لەیەکێك لەگوندەکانی عیجلی بەنی مەعقەل لەئیسفەهان یا لەشوێنێکی دیکە لەکوێستانەکان ژیانی بەسەر دەبرد. ناوی ئیبراهیم و نازناوەکەی حیکان بوو. ئیبراهیم بە عەبدولرەحمان ناوی برد و نازناوەکەی بۆ ئەبوموسلیم گۆڕی. ئەو لەگەڵ خاوەنەکەی خۆی، باوکی موسای زین دروستکەر، ژیانی بەسەر دەبرد. جڵەوەکانی کون دەکرد و پەتی تێهەڵدەکێشان و دەیدوورین و زینی دروست دەکرد. شارەزای خۆش کردنی پێستە و چەرم و زین دروست کردن بوو. زینەکانی بۆ ئیسفەهان، کوێستانەکان، جەزیرە، موسڵ، ئامەد، نەسیبین ، ئامەد و شوێنەکانی دیکە دەبرد و بازرگانی پێوە دەکردن.

عاسم کوڕی یونسی عیجلی، ئیدریس کوڕی مەعقەلی عیجلی و عیسا کوڕی مەعقەل، زیندانی بوون. ئەبوو موسلیم خزمەتی ئەوانی دەکرد. سلێمان کوڕی کەسیر و لاهیز کوڕی قورەیز و قەحتەبە کوڕی شەبیب ڕۆشتنە کوفە بۆ لای عاسم و چاویان بەئەبوو موسلیم کەوت. ئەویان لەگەڵ خۆیان برد و ئەبوو موسای زین فرۆش، بەودا، نامەیەکی بۆ ئیبراهیمی سەرکردەی عەباسیەکان نووسی. لەمەککە چاویان بەو کەوت. ئەبوموسلیمی بۆ خۆی هەڵگرت و خزمەتی ئەوی دەکرد.

دواتر ئەم کەسانە جارێکی دیکە ڕۆشتنە لای ئیبراهیم و داوای پیاوێکیان کرد تا لەگەڵ ئەوان بڕواتە خوراسان.

ئەمە، ڕەچەڵەکی بنەماڵەی ئەبوو موسلیم لەسەر بنەمای گێڕانەوەی ئەو کەسانەیە کەگومان دەکەن ئەو ئازادە بوو و کاتێك دەسەڵات وپێگەی بەرز بوویەوە، بانگەشەی ئەوەی کرد کەکوڕی سەلیت کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسە. داستانی سەلیت کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس بەمشێوەیە: ئەو کەنیزێکی بوو ((کەنیزێکی عەجەم بەلأم پەروەردەکراو لەناو عەرەبەکان))، زەردپێست. جارێك لەگەڵ ئەو نزیکی کرد بەلأم کەنیزەکە دووگیان نەبوو. بۆ ماوەیەك لەکەنیزەکەی نزیك نەکەوتەوە. ژنەکەی ئەمەی بەدەرفەت زانی و لەگەڵ یەکێك لەکۆیلەکانی مەدینە پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. کۆیلەکە نزیکی لەگەڵ کرد و ژنەکە، دووگیان و کوڕێکی هێنایە دنیا. عەبدوالله کوڕی عەباس سزایدا و کوڕەکەی کردە کۆیلە و ناوی نا سەلیت. کوڕەکە، چالاك و وردبین و وشیار و خزمەتی کوڕی عەباسی دەکرد. ئەو

لای وەلید کوڕی عەبدولمەلیك پێگەیەکی بەرزی بوو. بانگەشەی ئەوەی کرد کەکوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسە. ئەوی کردە ناو کاروبارەکانی وەلیدەوە چوونکە ڕق و کینەی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی لەدڵدا بوو. بڕیاریدا عەلی بۆ داوەری ببات. سەلیت ئەوی بردە لای دادیاری شارەکە و چەندین شایەتی ئامادە کرد کە عەبدوالله کوڕی عەباس، دانی بەوەدا ناوە کە سەلیت کوڕی ئەوە. شایەتەکان، شایەتییان دا و دادیار کەخوازیاری ڕەزامەندی وەلید بوو، فەرمانی خوای خستە ژێر پێ و ڕەچەڵەکی ئەوی پشتراست کردەوە.

سەلیت، لەسەر میرات، لەگەڵ عەلی کوڕی عەبدوالله دژایەتی کرد و عەل ئازاری زۆری لەدەستی ئەو بینی. پیاوێك لەمناڵەکانی ئەبوو رافیع هاوڕێیەتی عەلی دەکردو بە ((عمر الدن) ناویان دەبرد. ڕۆژێك عومەر الدن بەعەلی وت: دڵنیابە سەلیت دەکوژم و تۆ لەدەستی ئەو ئاسوودە دەکەم. عەلی ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت و ئاگاداری کردە ئەگەر ئەو کارە بکات، دەبێت بۆ هەمیشە لای ئەو نەمێنێت. چاکەی لەگەڵ سەلیت کرد تا عمر الدن دەستی لێهەلگرت.

ڕۆژێك لەڕۆژەکان، سەلیت لەگەڵ عەلی، ڕۆشتنە ناو یەکێك لەباخەکان لەدەرەوەی دیمەشق. عەلی خەوت و لەنێوان سەلیت و عمر الدن مشتومڕ و دەمەقاڵێ دروست بوو. عمر ئەوی کوشت و لەناو باخەکەدا بەخاکی سپارد. یەکێك لەکۆیلەکانی عەلی بۆ ئەم کارە هاوکاری کرد. هەردووکیان هەلاتن. سەلیت خاوەنێکی بوو و بینیبووی ئەو ڕۆشتۆتە ناو باخەکە. ئەوی نەدۆزییەوە و ڕۆشتە لای دایکی سەلیت و ئاگاداری کردەوە. عەلیش، کۆیلەکەی خۆی نەبینی. بەدوای سەلیت و دوو کۆیلەکەی گەڕا بەلام هیچ نیشانەیەکی لەوان نەبینی. دایکی سەلیت بەرەبەیان ڕۆشتە بەردەرگای وەلید و لەدەستی عەلی سکاڵای بەرز کردەوە. وەلید بیانوی گونجاوی دەستکەوت. عەلی بانگ کرد و سەبارەت بەسەلیت پرسیاری کرد. عەلی سوێندی خوارد کەئەوی نەبینیوە و نازانێت چ بەڵایەکی بەسەر هاتووە و هیچ فەرمانێکی بەکەس نەداوە. فەرمانیدا کۆیلەکەی عمرالدن، بێنێت. سوێندی خوارد کەنازانێت ئەو لەکوێیە. وەلید فەرمانیدا و ئاوی کارێزەکەیان بۆ ناو باخەکە بەردایەوە. کاتێك ئاو ڕۆشتە ژێر گۆڕەکەی سەلیت، پەیکەری سەلیت دەرکەوت. وەلید فەرمانی ئەشکەنجە کردنی عەلی دەرکرد و ئەوویان لەبەردەم هەتاوی سوتێنەردا ئازاب دەدا. جل و بەرگی پەشمینیان لەبەر کرد تا ڕاستییەکان بێنێتە سەرزمان و شوێنی کۆیلەکەیان نیشان بدات. بەلام ئەو هیچی نەدەزانی. عەباس کوڕی زیاد نێونجیگەری کرد و ئەوویان ئازاد کرد.

ئەویان بۆ حەمیمیە یا حیجر برد و تاکاتی مردنی وەلید لەوێ مایەوە. کاتێك سلێمان هاتە سەرکار، ئەوی بۆ دیمەشق گەڕاندەوە.

ئەمە یەکێك لەوشتانە بوو کەمەنسوری دەوانیقی ((دووەم خەلیفەی عەباسی)) پێش کوژرانی ئەبوو موسلیم، رەخنەی لێدەگرت و دەیوت: گومانت کردووە کەکوڕی سەلیتیت، بەمەیش رازی نەبوویت و ڕەچەڵەکی کەسێکت بۆ عەبدوالله گەڕاندەوە کەکوڕی ئەو نییە. تۆ کەوتوویتە هەڵدێری لەناوچوون.

هۆکاری تورە بوونی وەلید لەعەلی کوڕی عەبدوالله ئەوە بوو: عەبدولەلیك کوڕی مەروان، ژنەکەی و دایکی کوڕەکەی، کچی عەبدوالله کوڕی جەعفەری تەلأقدا و عەلی دەستبەجێ ئەوی کردە هاوسەری خۆی و لەبەر ئەمە دڵی عەبدولەلیك پیس و سەرکۆنەکانی دەستپێکرد، وتی: هەموو نوێژ و دۆعاکانی ئەو بۆ ریاکاری و خۆنواندنە. وەلید ئەم قسانەی لەباوکی بیست و ڕقی عەلی لەدڵ گرت.

دەستەیەك دەڵێن: ئەبوو موسلیم کۆیلە بوو. هۆکاری پەیوەست بوونی ئەو بەشوێنکەوتەکانی عەباسی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کەبووکەیر کوڕی ماهان دەبیری یەکێك لەکارگوزارەکانی سند بوو. هاتە کوفە و لەگەڵ لایەنگرانی عەباسی کۆبوویەوە. کەسێك فەرمانداری لەم کارە ئاگادار کردەوە و هەموویان کەوتنە زیندان. بووکەیر زیندانی و کەسانی دیکە ئازاد کران. عاسم و عیسا کوڕی مەعقەلی عیجلی لەزیندان و ئەبوو موسلیم خزمەتی ئەوانی دەکرد. بووکەیر پێشنیاری رازی بوون بەبۆچونەکانی خۆی پێکرد و رازی بوون. ئەو بەعیسا کوڕی مەعقەلی وت: ئەم کوڕە چ کارەی تۆیە؟ وتی: کۆیلەی منە. وتی: دەیفرۆشیت؟ وتی: بۆ تۆ. وتی: حەز دەکەم بەهاکەی وەربگریت. وتی: چەندەت پێخۆشە، دیاری بکە و کۆیلەکە بۆ تۆ. ئەو چوارسەد درەمی پێدا. دواتر ئەوان لەزیندان هاتنەدەر و بووکەیر ئەوی بۆ لای ئیبراهیمی رێبەری خۆیان ڕەوانە کرد. ئیبراهیم ئەوی بەموسای زین دروستکەر سپارد. ئەبوو موسلیم هەموو وتارەکانی باوکی موسای لەبەر کرد و دواتر لەنێوان خوراسان و عێراق، دەستی بەهاتوچۆ کرد.

دەستەیەك دەڵێن:؟ ئەو کۆیلەی کەسێك لەخەڵکانی هەرات یا پوشەنگە. خاوەنەکەی ڕۆشتە لای ئیبراهیم و ئەبوو موسلیم هاورێیەتی ئەوی دەکرد. ئیبراهیم، هەستی بەبیرمەندی ئەبوو موسلیم کرد. ئەوی کڕی و ئازادی کرد. ئەبوو موسلم چەند ساڵێك لای ئەو مایەوە. ئەبوو موسلیم سوارکەر، نامەکانی ئیبراهیمی بۆ خوراسان دەبرد. دواتر

ئیبراهیم ئەوی وەك نوێنەر و ڕێبەری شوێنکەوتەکانی بۆ خواوەند ڕەوانە کرد و فەرمانی ئەنجامدانی فەرمانەکانی ئەبوموسلیمی بەشوێنکەوتەکانیدا. بۆ ئەبوو مەسلەمەی خەلال، نامەی نووسی کەئەبوو موسلیمی ڕەوانە کردووە و دەبێت ئەو بۆ خوراسان بنێرن. ئەبوو موسلیم بەرەو خوراسان بەرێکەوت و لای سلێمان کوڕی کەسیر دابەزی. لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی درێژە بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەبوو موسلیم دەدەین.

ئەبوو موسلیم خەوی بینیبوو کەتیایدا فەرمانداری خوراسان و ناوچەکانی دەوروبەری بۆ دەستەبەر بووە. کاتێك گەیشتە نەیشابوور، بەگوندی بۆنخۆش دابەزی. گوندێکی ئاوەدان بوو. خاوەنی ئەو کاروانسەرای ئەبوو موسلیم، لەوێ دابەزی، داستانێکی گێڕایەوە، وتی: ئەم پیاوە گومان دەکات دەبێتە پاشای خوراسان. ئەبوو موسلیم بەمەبەستی کارێك ڕۆشتەدەر و یەکێك لەبێ سەرو پێکان، هەستا و کلکی کەرەکەی بڕی. کاتێك گەڕایەوە، بەخاوەنی کاروانسەراکەی وت: چ کەسێك کلکی کەرەکەی بڕیوم؟ وتی: نازانم. وتی: ناوی ئەم گەڕەکە چییە؟ وتی: بۆنخۆش. وتی: ئەگەر بۆنخۆش، بۆگەن نەکەم، ئەبوو موسلیم نەبم. کاتێك فەرمانڕەوایەتی خوراسانی گرتەدەست، ئەو ناوچەی وێران کرد.

## شەڕی نێوان بەلج و کوڕەکانی عەبدولمەلیك

مردنی بەلج و فەرمانداری سەعلەبە کوڕی سەلامە لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا شەڕێکی قورس لەئاندۆلۆس لەنێوان بەلج لەگەڵ ئومەییە کوڕی عەبدولمەلیك و قەتەن کوڕی عەبدولمەلیك دەستی پێکرد. هۆکاری شەڕەکە ئەوە بوو ((وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا)) ئەم دووانە لەقەرتەبە هەلاتن و باوکیان کوژرا. داوای هاوکاریان لەخەڵکی ئەو شارە و بەربەرییەکان کرد. دەستەیەکی فراوان لەدەوری ئەوان کۆبوونەوە کەوتراوە: ژمارەیان سەد هەزار پیاوی شەڕکەر بوو. بەلج و سوپاکەی ئەمەیان بیست و ڕووبەروویان بوونەوە و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. بەلج بریندار بوو. دواتر سەرکەوتنی بەسەر دوو کوڕەکەی عەبدولمەلیك بەدەستهێنا و بەربەرییەکانی سەرکوت و ژمارەیەکی زۆر لەوانی کوشت و سەرکەوتوو گەڕایەوە. بۆ ماوەی حەوت ڕۆژی دیکە ژیا و لەزیانی برینەکانی، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. مەرگی ئەو لەشوالی ئەم ساڵە، ئوتی ٧٤٢ زایینی ڕوویدا. ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو، یانزە مانگی خایاند.

کاتێك مرد، هاوەڵانی بەسەرکردایەتی سەعلەبە کوڕی سەلامە ڕازی بوون. ئەویان

هەڵبژارد چوونکە هوشام کوڕی عەبدولەلیک فەرمانی پێدا بوون: ئەگەر، بەڵایەك بەسەر بەلج و کولسوم بێت، سەعلەبە، ڕێبەری ئێوەیە. سەعلەبە کاروبارەکانی گرتەدەست. لەرۆژگاری ئەو بەربەرییەکان لەپانتاییەکانی ماردە، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە. سەعلەبە ڕووبەڕوویان بوویەوە و هەزار پیاوی لەوان ئەسیر کرد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، سلێمان کوڕی هوشام لەهاویندا شەڕی کرد و ڕووبەڕووی ئەلیۆن پاشای رۆم بوویەوە و تالآنی زۆری دەستکەوت. بە وتەی دەستەیەك: لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدواڵلە کوڕی عەباس چاوی لەدنیا بەست و پێشنیاری بەئیبراهیمی کوڕی کرد، درێژە بەبانگەوازی عەباسییەکان بدات. محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیل، ئاییتی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. هەروەها محەممەد کوڕی موسلیم کوڕی شەهابی زوهری مرد. ئەو لەساڵی ٥٨ یا ٥٠/ ٦٧٨ یا ٦٧٠ زایینی، چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و پێنجی کۆچی (( ٧٤٣ زایینی ))
## مردنی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك

لەم ساڵەدا، لەشەشەم ڕۆژی مانگی ڕەبیع الثانی/ ٢ ئوتی ٧٤٢ زایینی، هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، لەشاری ڕوسافە، چاوی لەجیهان بەست. ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەو نۆزدە ساڵ و نۆ مانگ و بیست و یەك ڕۆژ (( یا ١٩ ساڵ و ٨ مانگ و ١٥ ڕۆژ)) درێژەی کێشا. نەخۆشییەکەی خوناك (دیفتری)) بوو. ساڵەکانی ژیانی بۆ پەنجا و پێنج یا شەش ساڵ درێژ بوویەوە. کاتێك مرد، لەخەزێنەدار داوای (کۆمکۆم)ی (دەفرێك کەئاوی تیا گەرم دەکەن) کرد تا ئاوی تیا گەرم و جەستەی بشۆن. عەییاز دەبیرەکەی وەلید، ((لەبەر هۆکارێك کەئاماژەی پێدەدەین)) ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن. کۆمکۆمێکیان بەقەرز وەرگرت و ئەویان شۆرد. مەسەلەی کوڕی نوێژی لەسەر خوێند و جەستەی ئەویان لەروسافە بەخاك سپارد.

## کردار و نەریتەکانی هوشام

عێقال کوڕی شەبە دەڵێت: ڕۆشتمە لای هوشام، جل و بەرگێکی سەوز، دووراو لەپێستی ڕێوی خاڵداری لەبەردا بوو. فەرمانی پێدام بەرەو خوراسان بڕۆم. بەردەوام پێنشیاری بەمن دەکرد بەڵام من تەنیا سەیری جلەکانی ئەوم دەکرد. وتی: تۆ چییتە؟ وتم: پێش ئەوەی لەسەر تەختی خەلافەت، دانیشیت، جلوبەرگێکی هاوشێوەم لەبەر تۆدا بینی، ئێستا سەیرم دەکرد بزانم ئەوە یا نە. وتی: سوێند بەخوا، هەر ئەوە. بەڵام پاشەکەوت کردنی سامان و زێری من بۆ ئێوەیە. دەڵێت: پیاوێکی بیرمەند و فرەزان بوو. پیاوێکی مەسیحی لەیەکێك لەکۆیلەکانی محەممەد کوڕی هوشامیدا. کۆیلەیەکی خەساو لەکۆیلەکانی محەممەد، لەپیاوی مەسیحیدا و برینداری کرد. هەواڵی ئەم کارە بەهوشام گەیشت وکۆیلە خەساوەکەی بانگ کرد. کۆیلە، پەنای بۆ محەممەد برد. محەممەد وتی: ئایا من فەرمانی ئەم کارەم پێنەداییت؟ کۆیلە وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا تۆ فەرمانت پێدام. هوشام کۆیلەکەی قامچی باران و جوێنی بەکوڕەکەیدا.

عەبدوالله کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: هەموو دەفتەری

خەلیفەكانی ئومەوییم كۆكردەوە و هیچیان باشتر و بەسوودتر بۆخەڵكان و پاشا، لەدەفتەرەكەی هوشام نەبوو. دەڵێن: پیاوێكیان بردە لای هوشام كەچەند كەنیزێكی جوان روخسار و مەی و بەربەتیان لەماڵەكەی ئەودا بینیبوو. هوشام وتی: تەنبووری لەسەردا بشكێنن. كاتێك كێشایان بەسەریدا، پیرەپیاوەكە دەستی بەگریان كرد. هوشام وتی: دەبێت خۆڕاگر بیت. وتی: گومان دەكەن لەئازاری لێدانەكە، دەگریم؟ لەبەر ئەوە دەگریم كەبەربەتی نازەنینی منیان بەتەنبوور ناوبرد. پیاوێك بەشێوەیەكی توند لەگەڵ هوشام قسەی كرد. هوشام خۆڕاگرانە وتی: نابێتە لەگەڵ پێشەوای خەڵكان بەمشێوەیە قسە بكەیت. دەڵێن: هوشام یەكێك لەكورەكانی لەنوێژی هەینیدا نەبینی، لێی پرسی: بۆچی بۆ نوێژ نەهاتیت؟ وتی: چوارپێم نەبوو سواری بم. هوشام وتی: نەتدەتوانی بەپێ بێیت؟ یەك ساڵ رێگەی نەدا سوار چوارپێ و ئەسپ ببێت. دەڵێن: یەكێك لەكارگوزارەكانی سەبەتەیەك قۆخی بۆ نارد و نامەیەكی لەمبارەوە نووسی. هوشام وەڵامی دایەوە: قۆخەكانت گەیشت و سەروەری باوەڕداران زۆری پێ خۆش بوو. ئەندازەكەی زیاد و سەبەتەیەكی چاك، دروست بكە تا قۆخەكان بریندار نەبن. یەكێكی دیكە لەكارگوزارەكانی كارگی بۆ نارد. هوشام نووسی: كارگەكان گەیشت، چل دانە بوون كەهەندێك لەوان گوشران. كاتێك دەتەوێت شتێكی لەم چەشنە بنێریت، لەناو دەفرێكی باشدا بینێرە و زیخ بكەرە ناو دەفرەكە تا بەریەك نەكەون. پێیان وت: پیاوێكی رژد و ترسەنۆكیت، چۆن دەتوانی خەلافەت بگریتە دەست؟ وتی: كەسێكی خۆڕاگر و داوێن پاكم، چۆن چاوی تەماح نەبڕمە خەلافەت.

دەڵێن: هوشام لەروسافە یەكێك لەشارەكانی قێنسرین مایەوە. خەلیفەكان و خەلیفە زادەكان، پێش ئەو، لەترسی نەخۆشییە جۆراوجۆرەكان لەدەشتەكان ژیانیان بەسەر دەبرد. كاتێك هوشام مەبەستی ئەوەی كرد بڕواتە روسافە و لەو شارەدا بمێنێتەوە، وتیان: مەڕۆ، چوونكە خەلیفەكان نەخۆشییە گشتگیرەكان ناگرن و نەبینراوە خەلیفەیەك گرفتاری نەخۆشییەك بێت كەخەڵكان بەگشتی پێی گرفتار دەبن ((لەبەر ئەوەی بەشێوەیەكی تەندروست، خواردنیان بۆ ئامادە دەكرا) هوشام وتی: دەتانەوێت، ئەو كارە بەمن تاقیبكەنەوە. لەو شارە مایەوە كەشارێكی رۆمی بوو.

دەڵێن: جەعد كوڕی دێرهەم، لەرۆژگاری هوشام، باوەڕی خۆی سەبارەت بەئافراندنی قورئان، ئاشكرا كرد. هوشام ئەوی گرت و بۆ لای خالید كوڕی عەبدوڵلای قەسری نارد كەفەرمانداری عێراق بوو. فەرمانی كوشتنی ئەوی پێدا. خالید ئەوی خستە زیندان و

لەکوشتنی ئەو، خۆی بەدوور گرت. ئەم هەواڵە بەهوشام گەیشت، تورە بوو و نامەی بۆ خالید نووسی و سەرکۆنەی کرد و سوێندیدا تا جەعد بکوژێت. خالید، زنجیر لەدەست و پێ ئەوی هێنایە دەر و کاتێك لەنوێژی رۆژی جەژنی قوربان تەواو بوو، رۆشتە سەر تەختی وتاردان و لەکۆتاییدا وتی: بگەرێنەوە و قوربانی بکەن تا خوا بەقوربانییەکانی ئێوە رازی بێت چوونکە منیش ئەمرۆ دەمەوێت، بەسەربرینی جەعد، قوربانی بکەم چوونکە دەڵێت: خواوەند لەگەڵ موسا قسەی نەکرد و ئیبراهیمی وەك هاورێی خۆی هەڵنەبژارد، خواوەند پاکترە لەوەی جەعد باسی دەکات، گەورەتر لەوتاری ستەمکار و خراپەکاران. هاتەخوار و سەر بری.

دەڵێن: غەیلان کوری یونس (یاکوری موسلیم کوری مەروان) وتاری سەبارەت بە((توانایی)) لەرۆژگاری عومەر کوری عەبدولعەزیز، ئاشکرا کرد. عومەر ئەوی بانگ کرد و پێی وت تا لەوتەکانی خۆی پەشیمان ببێتەوە و تۆبە بکات. ئەو تۆبەی کرد و لەرۆژگاری هوشام کوری عەبدولمەلیك، دووبارە وتەکانی خۆی دووبارە کردەوە. هوشام ئەوی لەناسرەوە بانگ کرد و فەرمانی برینەوەی دەست وپێی ئەوی دەرکرد. دواتر ئەویان لەداردا.

هەروەها دەڵێن: محەممەد کوری زەید کوری عەبدواللە کوری عومەر کوری خەتاب، رۆشتە لای هوشام. هوشام وتی: تۆ لای من هیچ بەخششێکت نییە، ئاگاداربە کەس فریوت نەدات و بڵێت: سەروەری باوەرداران تۆی نەناسییەوە، بەباشی دەتناسم. تۆ محەممەد کوری زەید کوری عەبدواللە کوری عومەری خەتابی، لێرە مەمێنەرەوە چوونکە لەوەی کۆدەکرێتەوە، یەك دیناری بەتۆ نادەم. بگەرێرەوە بۆ لای کەسەکانت.

موجەمەع کوری یەعقوبی ئەنساری دەڵێت: هوشام جوێنی بەیەکێك لەگۆرانیبێژەکان وت: پیاوەکە وتی: تۆ جێگری خوایت لەسەر زەوی، شەرم ناکەیت، جوێن بەمن دەدەیت؟ هوشام، شەرمەزار بوو. وتی: تۆڵەی خۆت لەمن بستێنەرەوە. پیاو وتی: ئەوکات منیش دەبمە نەزانێکی وەك تۆ. هوشام وتی: بۆ ئەم تاوانەم، سامانێك لەمن بستێنە. وتی: یەك دینارم ناوێت. وتی: بەخوا، بمبەخشە. وتی: سەرەتا بەخوا و دواتر بەخۆتم بەخشی. هوشام سەری داخست و وتی: سوێند بەخوا، چیتر ئەو کارە دووبارە ناکەمەوە.

## وەرگرتنی بەیعەت بۆ وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیک

دەڵێن: وەرگرتنی بەیعەت بۆ ئەو دوای تێپەڕینی شەش ڕۆژ لەمانگی رەبیع الثانی ئەم ساڵە/ ٢ ئوتی ٧٤٣ زایینی بوو. پێشتر ئاماژەمان پێدا کەباوکی، فەرمانڕەوایەتی دوای براکەی خۆی، هوشام کوڕی عەبدولمەلیک، بەو سپارد. کاتێك وەلید بوو بەجێگری خەلیفە، تەمەنی پانزە ساڵ بوو. دوای ئەوە، باوکی زیندوو مایەوە تا تەمەنی وەلید گەیشتە پانزە ساڵ. یەزید بەردەوام دەیوت: خواوەند لەنێوان من و ئەو کەسەدا داوەر بێت کەهوشامی لەنێوان ئێمەدا جێگە کردەوە. کاتێك هوشام هاتە سەرکار، رێزی لەوەلید کوڕی یەزید گرت تا ئەوەی نیشانەکانی مەیخۆری و کارە نەشیاوەکانی لەودا بینی. عەبدولسەمەد کوڕی عەبدولعەلی ((ئامۆژیار و راهێنەری ئەو)) بۆ ئەم کارانە ناچاری دەکرد. ئەو چەندین کەسی وەك هاونشینی خۆی هەڵبژارد و لەگەڵ ئەوان بەزمی خواردنەوەیان رێکدەخست. هوشام مەبەستی ئەوەی کرد، وەلید لەو کەسانە جیا بکاتەوە. لەبەر ئەمە لەساڵی ١١٦/ ٧٣٤ زایینی فەرمانی ئەنجامدانی ئایینی حەجی پێدا. ئەو لەناو سنوقەکان، چەندین سەگی بۆ خۆی هەلگرت و گومەزێکی هاوشێوەی کەعبە دروست کرد تا بیخەتە سەر کەعبە. شەرابی لەگەڵ خۆی برد و بڕیاریدا لەسەر گومەزەکەن لەسەر کەعبە بەجێی بێڵێت و لەخوارەوە، بخواتەوە. هاوەڵانی رێگەی ئەم کارەیان لێگرت و وتیان: دڵنیانین لەوەی خەڵکان هێرش نەکەنە سەرمان و تۆ لەسەر کار لابەن. ئەو لەبڕیارەکەی پەشیمان بوویەوە.

خەڵکان ئەو کارانەیان لەوەلید بینی کەبێ رێزی بوو بەرابەر بەئایینی ئیسلام. هوشام هیوادار بوو بتوانێت وەلید لەسەر کار لاببات و بۆ کوڕەکەی خۆی، مەسلمە، بەیعەت وەربگرێت. داوای لەوەلید کرد بەم کارە رازی ببێت. وەلید رازی نەبوو. هوشام وتی: دوای تۆ، ئەو دەکەمە خەلیفەی موسوڵمانان. دووبارە رازی نەبوو. هوشام توڕە و مەبەستی زیان گەیاندن بەوەلید و وەرگرتنی بەیعەت بۆ کوڕەکەی لەسەردا پەروەردە دەکرد. دەستەیەك بۆ ئەم کارە هاوکاریان کرد. دوو خاڵەکەی یانی محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیل و ئیبراهیم کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیل و منالەکانی قەعقاع کوڕی خولەیدی عەبسی و کەسانی دیکە( لەکەسە نزیکەکانی) لەناویاندا دەبینران. وەلید رابواردن و شەراب خواردنەوەی لەئەندازە بەدەر کرد. هوشام پێی وت: هاوار لەتۆ وەلید، تۆ باوەڕت بەئایینی ئیسلام هەیە یا نە؟ هیچ کارێکی نەشیاو و ناڕەوا نەماوەتەوە ئەنجامی نەدەیت. هیچ کارێکی حەرام نەماوەتەوە ئەنجامی نەدەیت و هیچ مەشروبێك نەماوەتەوە، نەیخۆیت. گرنگی

بەهیچ کارێك نادەیت. وەلید بۆی نووسی:

یا ایها السائل عن دیننا نحن علی دین ابی شاکر

نشر بها صرفا و ممزوجة بالسخن احیانا و بالفاتر

یانی: ئەی پرسیارکەری دین و ئایینی ئێمە! بزانە باوەڕمان بەئایینی باوکی شاکر هەیە، هەندێ کات تێکەڵ بەئاو دەیخۆینەوە و هەندێ کات بێ ئاو، هەندێ کات گەرم و هەندێ کات نیوە گەرم.

هوشام لەمەسلەمەی کوڕی توڕە بوو. نازناوی مەسلەمە باوکی شاکرە. پێی وت: بۆ کارەکانی تۆ سەرکۆنەی من دەکات و من دەمەوێت تۆوەك جێگری خەلیفە دەستنیشان بکەم! ئەوی هاندا و لەنوێژە گشتیەکاندا دەبینرا. لەساڵی ١١٩/ ٧٣٧ زایینی ئەوی کردە ڕێبەری حەجکەران تا ئایینی حەج لەگەڵ خەڵکان ئەنجام بدات. مەسلەمە خوپارێزی و خواپەرەستی لەخۆی نیشاندا و دواتر لەمەککە و مەدینە سامانەکانی دابەش کرد. یەکێك لەموالییەکانی خەڵکانی مەدینە وتی:

یا ایها السائل عن دیننا نحن علی دین ابی شاکر

الواهب الجرد بارسانها لیس بزندیق و لا کافر

یانی: ئەی پرسیارکەری دین و ئایینی ئێمە! بزانە باوەڕمان بەئایینی باوکی شاکر هەیە، ئەو کەسەی ئەسپە یاڵ کورت و لۆق درێژەکان، بەجڵەوی زێڕین، دەبەخشێت و نە زەندیقە و نە ناباوەڕ.

هوشام بەردەوام ڕەخنەی لەوەلید دەگرت و خراپەی ئەوی دەهێنایە سەرزمان. سەرکۆنەی دەکرد و بەکەسێکی لاواز، وەسفی دەکرد و ڕێگەی خۆتێهەڵقورتاندن لەکاروبارەکانی لێدەگرت. وەلید لەگەڵ کەسە تایبەت و کۆیلەکانی خۆی ڕۆشتەدەر و لەئەزرەق لەسەر ئاوێك لەئەردەم، کەمڵکی خۆی بوو، دابەزی و دەبیرەکەی، عەییاز کوڕی موسلیمی لای هوشام بەجێهێشت تا بەردەوام هەواڵی کارەکانی ئەوی بۆ بنوسێت. هوشام بەخششەکانی وەلیدی بڕی. وەلید لەمبارەوە نامەی بۆ نووسی بەڵام هوشام وەڵامی نەدایەوە و فەرمانی پێدا، مامۆستا خراپەکەی خۆی، دووربخاتەوە. وەلید داوای مۆڵەتی کرد تا ڕێگە بە کوڕی سوهەیل بدات، بڕواتە لای. هوشام کوڕی سوهەیلی ئەشکەنجە و دواتر، ڕەوانەی کرد. عەییاز کوڕی موسلیم، دەبیرەکەی وەلیدی ئەشکەنجە کرد و خستیە زیندان. وەلید وتی: ئەم پیاوە یەك چاوە شوومە، باوکم بۆ ئەو پێگەیە بەرزی کردەوە و تەختی خەلافەتی

خۆی بەو سپارد، ئێستا ئەو کارە لەگەڵ من دەکات، کەدەیبینن. هەرکەس کەمنی بووێت، گاڵتە و ئەشکەنجەی دەکات. نامەی بۆ هوشام نووسی و لەمبارەوە سکاڵا و داوای کرد، دەبیرەکەی ئازاد بکات. هوشام ئەوی ئازاد نەکرد. وەلید بۆی نووسی:

| | |
|---|---|
| رایتك تبنی دائما فی قطعتی | و توکنت ذاحزم لهد مت ما تبنی |
| تثیر علی الباقین مجنی ضغینة | فویل لهم لو مت من شر ما تجنی |
| کانی بهم و اللیت افضل قولهم | الا لیتنا و اللیت اذ ذاك لا یغنی |
| کفرت یدا من منعم لو شکرتها | جزاك به الرحمان ذوالفضل و المن |

یانی: تۆ دەبینم بەردەوام ڕێگەی دوور کەوتنەوە لەمن دەبڕیت، ئەگەر کەسێکی دوورئەندێش دەبوویت، ئەوەی بەهێزت کردووە، وێرانت نەدەکرد. بۆ پاشماوەکان، میوەی کینەی دێرینە، بەرهەم دێنیت، ئەی هاوار بۆ ئەو کەسانە لەزیانی ئەو تاوانانەی تۆ ئەنجامیان دەدەیت. لەئێستاوە ئەوان دەبینم کەباشترین وتەیان (بووك و مەگەر) وتنە، دەڵێن: خۆزگە ئێمە، بەڵام خۆزگەی ناوادە، هیچ سوودێکی نییە. دەستی بەخشەرێکت بەناسپاسی گووشی کەئەگەر سپاست دەکرد، خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان، پاداشتی چاکیەکانتی پێدەبەخشی.

وەلید لەبیابان مایەوە تا ئەو کاتەی هوشام مرد. کاتێك بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە داهات کەخەلافەتی گرتەدەست، بەکوڕی زوبەیر، مونزەر کوڕی عومەری وت: لەو کاتەوەی هەستم بەئاوزی خۆم کردووە، شەوێکی درێژتر لەدوێنێکەم لەبیر نییە. سوپای خەم هێرشیان کردەسەرم و بیرم لەکارەکانی ئەم پیاوە دەکردەوە. دڵم کەوتە جۆش، باسوار بین و دەمەتەقێ بکەین. سوار بوون و دوو میل ڕێگەیان بڕی. ڕۆشتە سەر تەپۆڵکەیەك، تەپ و تۆزێکی لەدوورەوە بینی و وتی: نێردراوەکانی هوشامن. هیوادرام هەواڵێکی خۆشیان پێبێت. دوو پیاو دەرکەوتن: یەکیان کۆیلەی باوکی محەممەدی سوفیانی و ئەوی دیکەیان، جەردەبە. کاتێك لێی نزیك کەوتنەوە، دابەزین و بەراکردن ڕۆشتنە لای وەلید و وەك خەلیفە سڵاویان بۆ نارد. لەرزی و زمانی گیرا و وتی: هوشام مرد؟ وتیان: بەڵێ. ئەو نامەی بەئێمەیە، نامەی سالم کوڕی عەبدولرەحمان، دەبیری دەبیرخانەیە. نامەکەی خوێندەوە و لەکۆیلەکەی باوکی محەممەد، سەبارەت بەدەبیرەکەی خۆی، عەییاز، پرسیاری کرد. وتی: تا کاتی مەرگی هوشام لەزینداندا بوو. پەیامی بەخەزێنەدارەکان کرد، ئەوەی لەدەستیاندایە، بیپارێزن. هوشام هاتە هۆش و داوای شتێکی کرد، بەڵام پێیان نەدا. وتی: پەنا بەخوا! هەمووومان خەزێنەداری

وەلید بووین. لەهەمان سات، چاوی لەدنیا بەست. عەییاز کوڕی موسلیم لەزیندان هاتەدەر و دەرگای خەزێنەکانی بەست و مۆری کرد و هوشامی لەسەر تەختی خەلافەت هێنایە خوار. کۆمکۆمیان دەستنەکەوت تا ئاوی تیا گەرم بکەن، بەناچار لەکەسانی دیکەیان وەرگرت. لەگەنجینەکەی ئەو، کفنیان نەبینی تا ئەوەی کۆیلەکەی کفنی کرد. وەلید وتی:

هتك الاحول المشو م فقد ارسل المطر

و ملكنا من بعد ذا كوري فقد اورق الشجر

فاشكروا الله انه زائد كل من شكر

یانی: پیاوی یەك چاوی شووم، گیانی سپارد و بارانی باراند. دوای ئەو، بووینە پاشا و داری ئارەزوو، بەری دەرکرد. سپاسی خوا بکەن، چوونکە بەردەوام بەسپاسکەران دەبەخشێت.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم هۆنراوەیە، هۆنراوەی وەلید نییە.

کاتێك وەلید هەواڵی مردنی ئەوی بیست، نامەی بۆ عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولەلیك کوڕی مەروان نووسی تا بێتە روسافە و هەموو سامانەکانی هوشام و منداڵەکانی بخەملێنێت و کارگوزار و نۆکەرەکان و کەسانی دوروبەری ئەو بگرێت جگە لەمەسلمە کوڕی هوشام کە لەگەڵ باوکی قسە و پێشنیاری چاکەکاری لەگەڵ ئەوی بەوەلید کردبوو. عەباس هاتە روسافە و فەرمانەکانی باوکی ئەنجامدا و وەلیدی لەدەرئەنجامەکانی ئاگادار کردەوە. وەلید وتی:

ليث هشاما كان حيا يرى محلبه الا وفر قد اترعا

ليث هشاما عاش حتى يرى مكياله الا وفر قد طبعا

كلناه بالصاع الذى كاله و ما ظلمناه به اصبعا

و ما اتينا ذاك عن بدعة احله القرآن لى اجمعا

یانی: خۆزگە هوشام زیندوو دەبوو تا دەیبینی پێوانەی گەورە و بێ کەم کوڕی ئەو پڕ بووە. خۆزگە هوشام زیندوو دەبوو تا دەیبینی پیاڵە قووڵەکەی لێوانلێو بووە. بەهەمان پیاڵە، بۆ ئەومان پێوانە کرد کە بۆ ئێمەی پێوانە کرد. یەك جمگەی پەنجە، ستەممان لێنەکرد. ئەمەمان بۆ دروست کردنی دیاردەیەکی نەشیاو ئەنجامنەدا، نووسراوی جیاکەرەوەی راستی لەدروستی (قورئان) ئەو کارانەی بۆ ئێمە ڕەوا کرد.

وەلید هاوەڵان و کەسانی هوشامی گرفتار کرد. یەکێك لەنۆکەرەکانی ڕۆشتە سەر

گۆڕەکەی هوشام و گریانی دەستپێکرد، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر زیندوو دەبوویت و دەتبینی وەلید چ بەڵایەکمان بەسەردا دێنێت! کەسێك کە لەوێ بوو، وتی: ئەگەر دەتزانی ئێستا لەجەهەننەم چی لەهوشام دەکەن، دەتزانی لەناو نیعمەتێکدا دەژیت کەناتوانی سپاسی بکەیت! هوشام سەرقاڵی گرفتارییەکانی خۆیەتی و ناتوانێت فریای ئێوە بکەوێت.

وەلید کارگوزارەکانی خۆی دەستنیشان و نامەی بۆ شارەکان نووسی و فەرمانیدا بەیعەت لەخەڵکان وەربگرە. نامەی کارگوزارەکان گەڕایەوە و بەیعەتی خەڵکانیان ڕاگەیاند. مەروان کوڕی محەممەد نامەی بۆ نووسی و ئاگاداری کردەوە کەبەیعەتی لەخەڵکان وەرگرتووە و مۆڵەتی دەوێت تا سەردانی بکات. کاتێك وەلید هاتە سەرکار، بۆ پەککەوتەو کوێرەکانی شام، بژێوی مانگانە و بۆ هەرکامیان نۆکەریکی دیاریکرد. بۆ نانخۆرانی خەڵك، بۆنی خۆش و جل و بەرگی لەگەنجینەکان دەرهێنا و بەخششەکانی ئەوانی دەدە زیاد کرد. دوای ئەم زیاد کردنە، دووبارە مانگانی خەڵکانی شامی دەدە زیاد کرد. میوانەکان لەدەوری ئەو کۆبوونەوە. هەرکەس هەرچی دەویست، دەیوت:

| | |
|---|---|
| ضمنت لكم ان لم تعقنى عوائق | بان سماء الضر عنكم ستقلع |
| سيوشك الحاق معا زيادة | و اعطية منى عليكم تبرع |
| محر مكم ديوانكم و عطاؤكم | به تكتب الكتاب شهرا و قطبع |

یانی: بەڵێن دەدەم ئەگەر ڕێگرەکان، ڕێگەم لێنەگرن، ئاسمانی سەختی و هەژاری، چیتر لەسەر سەری ئێوە نەبینرێت. بەزووترین کات، پەیوەست و زیاد کردن و بەخشش لەمن، دەبینن بێ ئەوەی خۆتان داوای بکەن. بەخشش و گەنجخانەکانی ئێوە، بۆ خۆتان پارێزراوە، مانگانە دەبیرەکان لەو بەخششانە دەنووسن و مۆری دەکەن.

حلم الوادی گۆرانیبێژ دەڵێت: لەگەڵ وەلیددا بووم ئەوکاتەی هەواڵی مەرگی هوشامیان بۆ هێنا و مژدەی خەلافەتیان پێدا. پیرۆزباییان لێکرد و مۆر و قامچی تایبەت بەخەلافەتیان بەو سپارد. ماوەیەك بێدەنگ بووین و سەیری چاوی خەلیفەمان دەکرد. لەناکاو وتی: ئەم هۆنراوەیە بەگۆرانی بۆ ئێمە بخوێنن و تار بژەنن:

| | |
|---|---|
| طاب يومى و لذ شرب السلافة | و اتانا نعى من بالرصافة |
| و اتانا البريد ينعى هشاما | و اتانا بخاتم للخلافه |
| فاصطبحنا من خمر عانة صرفا | و لهونا بقينة عرافه |

یانی: ئەمرۆی من خۆش بوو و خوادرنەوەی باشترین شەراب، نۆشی گیانم بێت، هەواڵی مەرگی کەسێك بەنێمە گەیشت کە لەروسافە دەژیا. پەیك هات و هەواڵی مەرگی هوشامی مۆر و ئەنگوستیلەی خەلافەتی هێنا. بەرەبەیانیمان بە شەرابی پاکی (عانە) دەستپێکرد و رۆژمان لەگەڵ کچێکی ئاشنا بەهونەرەکانی دلڕفاندن بەسەر برد.

سوێندی خوارد لەشوێنی خۆی هەڵنەستێت تا ئەم هۆنراوەی بۆ بخوێنن و بەخۆشی ئەو هۆنراوەیە، پێکی هەڵدا. ئەو کارەمان کرد و تا شەو دەرنگان گۆرانیمان خوێند و خواردمانەوە و کردمان.

لەم ساڵەدا، وەلید فەرمانڕەوایی دوای خۆی تایبەت کرد بەدوو کوڕەکەی یانی حەکەم کوڕی وەلید و عوسمان کوڕی وەلید و ئەم دووانەی وەك جێگری خەلافەت دەستنیشان کرد. حەکەمی پێش خست و لەمبارەوە نامەی بۆ شارەکان و کاربەدەستەکانی ڕەوانە کرد.

## فەرمانداری نەسر کوڕی سەیار لەخوراسان و لەلایەن وەلیدەوە

لەم ساڵەدا وەلید، نەسر کوڕی سەیاری کردە تاکە فەرمانڕەوای سەراسەری خوراسان. دواتر یوسف کوڕی عومەر بۆ میوانی وەلید ڕۆشتە شام و نەسر و کارگوزارەکانی لەو کڕییەوە. وەلید فەرمانداری خوراسانی بۆ ئەو گەڕاندەوە. یوسف نامەی بۆ نەسر نووسی و فەرمانی پێدا، سەردانی بکات و تا دەتوانێت دیاری و خەڵات و سامان لەگەڵ خۆی بێنێت. نەسر، هەموو کەسەکان و سامانەکانی خۆی هەڵگرت و بۆ لای ئەو بەرێکەوت. وەلید نامەی بۆ نەسر نووسی تا بەربەت و تەبیرە و دەفرە زێرین و زیوینەکان و هەموو ژەنەرەکان و هەڵۆ راوچییەکان و ماینە تایبەتەکانی سواری لەگەڵ خۆی بێنێت. خۆی و گەورەکانی خوراسان سەردانی بکەن.

ئەستێرەناسەکان نەسریان ئاگادار کردبوویەوە کەبەم زوانە ئاژاوەیەکی سەراسەری دەستپێدەکات. یوسف پێداگری کرد تا نەسر بڕواتە لای ئەو. بۆ ئەم کارە، نێردراوێکی تایبەتی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا هانی بدات و ئەگەر بەرێنەکەوت، لەناو خەڵکان جار لەسەر کار لابرانی ئەو لێبدات. نەسر ڕێزی لەنێردراوەکە گرت و داوای مۆڵەتی لێکرد. زۆری نەخایاند ئاژاوەی سەریهەڵدا. نەسر ڕۆشتە کۆشکە تایبەتەکەی خۆی لەماجان و بەنوێنەرایەتی خۆی، عەسمە کوڕی عەبدوڵڵەی ئەسەدی کردە فەرمانداری خوراسان، موسا

کوڕی وەرقای کردە فەرمانداری چاچ، حەسانی لەخەڵکانی سەغد کردە فەرمانداری سەمەرقەند و موقاتیل کوڕی عەلی کردە فەرمانداری ئامۆل. فەرمانی پێدان کاتێك هەواڵی بەرێکەوتنی ئەویان بیست، تورکەکان بانگ بکەن تا لەماوەرا ئەلنەهر بپەڕنەوە بۆ ئەوەی بۆ لای ئەوان بگەڕێتەوە. نەسر بەرەو عێراق بەرێکەوت.

لەو کاتەی لەسەر ڕێگەی خوراسان بوو، یەکێك لەموالیەکانی بەنی لەیش، شەوانە ڕۆشتە لای و هەواڵی کوژرانی وەلیدی پێدا. کاتێك بەیانی بوویەوە، خەڵکی کۆکردەوە و فەرمانی بەنێردراوەکانی وەلیددا تا ئامادە ببن. بەوانی وت: بینیتان کەبەرێکەوتم و ئەم هەموو دیاری و سامانەم لەگەڵ خۆم هێناوە. دیاریەکانم تا بەیهەق هەڵگرتووە. دوێ شەو، فلان کەس هاتە لام و هەواڵی کوژرانی وەلیدی پێدام. ئاژاوە لەشام سەری هەڵداوە. مەنسور کوڕی جمهور ڕۆشتۆتە ناو عێراق و یوسف کوڕی عومەر هەڵاتووە. ئێمە لەشارێك ژیان و فەرمانڕەوایەتی دەکەین کەخۆتان دەزانن و دوژمنە فراوانەکانی، دەناسن. سالم کوڕی ئەحوەز هەستا و وتی: ئەم بەشێکە لەفێڵەکانی قوڕەیش کەدەیانەوێت ملکەچی و فەرمانبەری تۆ بەفیڕۆ بدەن. درێژە بەرێگەی خۆت بدە و ئێمە تاقی مەکەرەوە. نەسر وتی: ئەی سالم، تۆپیاوێکی شارەزا لەکاروباری جەنگ و گوێرایەڵی ئومەوییەکانی بەڵام ئەندێشەی تۆ سەبارەت بەکارە دژوارەکان، ئەندێشەی کەنیزێکی دانشکاوە. نەسر لەگەڵ خەڵکان گەڕایەوە.

## کوژرانی یەحیا کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین لەخوراسان کوژرا. چۆنیەتیەکەی ئەوەی کە: کاتێك ئەو بەدوای کوژرانی باوکی، (وەك باسمان کرد) ڕۆشتە خوراسان، بەرەو بەلخ بەرێکەوت و لەوێ، لای حورەیش کوڕی عومەر کوڕی داوود دابەزی و مایەوە تا ئەو کاتەی هوشام مرد و وەلید کوڕی یەزید هاتە سەرکار. یوسف کوڕی عومەر نامەی بۆ نەسر کوڕی سەیار نووسی یەحیا هاتۆتە خوراسان و لەماڵی عەمرۆ نیشتەجێ بووە. فەرمانی پێدا: بەدژوارترین شێوە، گەمارۆی بخەسەر. نەسر، حورەیشی گرت و داوای یەحیای کرد. وتی: ئاگاداری نیم. فەرمانیدا و شەسەد قامچیان لێدا. حورەیش وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەژێر ئەم قاچەمدا بێت، قاچم هەڵناگرم. کاتێك قوڕەیش کوڕی حورەیش ئەمەی بینی، وتی: باوکم مەکوژە و من شوێنی یەحیات نیشان دەدەم. لەشوێنی یەحیا

ئاگاداری کردەوە و نەسر ئەوی گرت و وەلیدی لەگرتنی ئەو ئاگادار کردەوە، وەلید نامەی بۆ نووسی تا ئەمانی پێ ببەخشێت و خۆی و هاوەڵانی ئازاد بکات. نەسر ئەوی ئازاد کرد و فەرمانیدا دوو هەزار درەمی پێبدەن. وتی: برۆ بۆ لای وەلید. یەحیا ڕۆشتە سەرخس و لەوێ مایەوە. نەسر بۆ عەبدوالله کوڕی قەیس کوڕی عوبادی نووسی تا لەوێوە ڕەوانەی بکات. ئەو، یەحیای ڕەوانە کرد. یەحیا بەرێکەوت تا گەیشتە بەیهەق. ترسا یوسف کوڕی عومەر، بیکوژێت و لەبەر ئەمە ڕێگەی نەیشابووری گرتەبەر کەعەمرۆ کوڕی زەرارە فەرمانڕەوایەتی دەکرد. یەحیا حەفتا پیاوی شەڕکەری لەگەڵدا بوو. ئەو چەند بازگانێکی بینی و چوارپێکانی ئەوانی گرت و وتی: بەهاکەی لەئەستۆی ئێمەدایە. عەمرۆ کوڕی زەرارە نامەی بۆ نەسر نووسی و لەکارەکانی یەحیا ئاگاداری کردەوە. نەسر نامەی نووسی و فەرمانی شەڕی پێدا. عەمرۆ هاوڕێ لەگەڵ دەهەزار پیاوی شەڕکەر و یەحیا بەحەفتا پیاو، ڕوبەروی یەکبوونەوە. یەحیا شکستی پێهێنا و عەمرۆ کوڕی زەرارە کوژرا و مەڕومالآت و چوارپێکانی ئەوانی گرت و بەرەو هەرات بەرێکەوت. بەلآم لەوێ نەمایەوە.

نەسر کوڕی سەیار، سالك کوڕی ئەحوەزی بەشوێن یەحیادا ڕەوانە کرد. لەجوزجان ڕووبەڕوی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد. تیرێك بەرناوچاوی یەحیا کەوت. پیاوێك لەعەنەزە بەناوی عیسا، تیری بۆ هاویشت. یارانی یەحیا تا دوایین کەس کوژران. سەری یەحیایان بڕی و هەڵیانگرت و کراسەکەیان لەجەستەی دەرهێنا.

کاتێك هەواڵی کوژرانی یەحیا، بەوەلید گەیشت، نامەی بۆ یوسف کوڕی عومەر نووسی: گوێرەکەی عێراقیەکان کەزەیدە، بێنەرە خوار و لەناوی ببە و بیسوتێنە و خۆڵەمێشەکەی بکەرە ناو دەریا. یوسف کوڕی عومەر فەرمانی سوتاندنی دەرکرد و دواتر خۆڵەمێشەکەیان بردە ناوەڕاستی دەریا و کردیانە ناو ئاوەکە.

دووای کوژران، لەجوزجان یەحیایان بەدارەوە هەڵواسی. بەدارەکەوە مایەوە تا ئەوکاتەی ئەبوموسلیمی خوراسانی دەرکەوت و فەرمانڕەوایەتی خوراسانی گرتەدەست. ئەبوموسلیم فەرمانیدا و پەیکەرەکەیان هێنایە خوار و نوێژیان لەسەر خوێند و دواتر دفن و پرسەیان بۆ گێڕا. ئەبوموسلیم دەفتەری ئومەوییەکانی گرت و سەیری کرد تا بزانێت چ کەسانێك لەکوشتنی یەحیایدا بەشدار بوون. ئەوانەی کوشت کەزیندوو بوون و ئەوانەی مردبوون، سزای بەسەر ماڵ و منالەکانیاندا سەپاند. دایکی یەحیا ناوی ریتە کچی باوکی هاشم عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی حەنیفەیە.

## فەرمانداری حەنزەلە لەئەفریقییە

## فەرمانداری باوکی خەتار لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا باوکی خەتار حوسام کوڕی زێڕای کەلبی وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس ڕۆشتە ئەو دیارە. ئەم ڕووداوە لەمانگی ڕەجەب/ مەی ٧٤٣ زایینی ڕوویدا. کاتێك ئەبوو خەتار چاوی بەکارگوزارەکانی ئاندۆلۆس کەوت، و ئەوان پەیمانی پارێزگاری کردن لەیەکتریان بەستبوو، هۆنراویەکی خوێندەوە و تیایدا باسی شەڕی مەرج راهیتی کرد و بیری خستنەوە لەو ڕۆژەدا چۆن کەلبیەکان لەبەرژەوەندی مەروان پیاوانە شەڕیان کردووە و قەیسیەکان لەزیانی مەروان و لەبەرژەوەندی زوحاك کوڕی قەیسی فیهری. بەشێك لەهۆنراوەکە بەمشێوەیە:

| | |
|---|---|
| افادت بنو مروان قیسا دماونا | و فی الله ان لم یعدلوا حکم عدل |
| و قیناکم حر القنا مرج راهط | و لم تعلموا من کان ثم له الفضل |
| وقیناکم حر القنا بنحورنا | و لیس لکم خیل تعد و لا رجل |

یانی: منالەکانی مەروان خوێنباییان بۆ قەیسیەکان برد و ئێمەیان کڕییەوە. ئەگەر بەدادپەروەری هەڵس و کەوتیان لەگەڵ ئێمە نەکردبێت، خواوەند هاوشێوەی فەرمانڕەوایەکی دادپەروەرە. دەڵێی لەشەڕی مەرج راهیت بەشداریتان نەکردووە و نەتانزانیوە لەو کاتە دژوارەدا، گەورەیی و سالاری تایبەت بەچ کەسانێك بوو.

کاتێك ئەم هۆنراوە بەگوێی هوشام گەیشت، پرسیاری ئەوی کرد و وتیان: پیاوێکە لەکەلب. هوشام، حەنزەلە کوڕی سەفوانی کەلبی لەساڵی ١٢٤/ ٧٤٢زایینی، وەك فەرمانداری ئەفریقییە دەستنیشان کردبوو. نامەی بۆ نووسی تا ئەبوو خەتار وەك فەرمانداری ئاندۆلۆس دەستنیشان بکات. حەنزەلە، ئەو کارەی کرد و بەرێکەوت. ڕۆژی هەینی ڕۆشتە ناو قەرتەبە و بینی فەرماندارەکەی سەعلەبە کوڕی سەلامە هەزار ئەسیری بەرپەری کۆکردۆتەوە تا سەریان ببڕێت. کاتێك ئەبوو خەتار ڕۆشتە ناو شارەکە، ئەسیرەکانی بەو سپارد. فەرمانداری ئەبوو خەتار بووە هۆی زیندوو مانەوەی ئەسیرەکان. ئەو شامییانەی لەئاندۆلۆس بوون، دەیانویست لەگەڵ سەعلەبە بۆ شام بگەڕێنەوە. ئەبوو خەتار ڕێزی گرتن و چاکەی لەگەڵ کردن. ئەوان مانەوە. هەر دەستەیەکی لەناو گەرەك و ماڵەکانی هاوشێوەی شام جێگە کردەوە. کاتێك شارێکی هاوشێوەی شارەکەی خۆیانیان بینی، نیشتەجێ بوون. دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوە خەڵکانی شامی بڵاو کردەوە چوونکە قەرتەبە بۆ ئەوان

شوێنێکی بچوك بوو. بەشێك لەگێڕانەوەکانی تایبەت بەوانمان لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ١٣٩/ ٧٥٦ باس کردووە.

بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

دەڵێن: لەم ساڵەدا وەلید، خاڵەکەی خۆی، یوسف کوڕی محەممەد کوڕی یوسفی سەقەفی وەك فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف دەستنیشان کرد و محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیلی مەخزومی و ئیبراهیم کوڕی هوشامی زیندانی و لەبەرابەر خەڵکان رایگرتن. ئەوانی لەشەعبانی ئەم ساڵە هێنایە مەدینە. دواتر ئەوانیان بردە شام بۆ لای وەلید. وەلید فەرمانیدا و بەقامچی، ئەشکەنجەیان کردن. محەممەد وتی: تۆ بەخزمایەتیت لەگەڵ خۆمان سوێند دەدەم. وەلید دەیوت: چ خزمایەتیەك لەنێوان من و تۆدا هەیە؟ دەیوت: ئەگەر خزمیش نەبین، وتاری پێغەمبەرە کەدەفەرمێت تەنیا لەکاتی (حد) دەبێت قامچی بەکار ببرێت. وتی: لەبەر حەد و لەبەر تۆڵە سەندنەوەی خۆم، قامچی بارانت دەکەم. تۆ یەکەم کەس بوویت سەبارەت بەکوڕە مامەکەی من و کوڕە مامی سەروەری باوەڕداران عوسمان کوڕی عەفان، (( عەرەجی))خراپەت کرد. محەممەد ئەم عەرەجییەی گرت و لەبەر دەم خەڵکان رایگرت. دواتر بەقامچی ئەشکەنجە و زیندانی کردبوو. لەزیندان مابوویەوە و دوای نۆساڵ، مرد. لەبەر ئەوەی عەرەجی لەهۆنراوەکانی خۆی، بەخراپی وەسفی کردبوو. وەلید فەرمانیدا خۆی و براکەیان قامچی باران کرد. دواتر بەندی ئاسنینیان کردە پێیان و بۆ عێراق بۆ لای یوسف کوڕی عومەر، ڕەوانەیان کردن. کاتێك گەیشتنە لای یوسف، ئەوەندە ئەشکەنجەی کردن تا مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا وەلید، سەعد کوڕی ئیبراهیمی لەسەرپەرەستی کردنی دامەزراوەی دادی مەدینە لابرد و یەحیا کوڕی سەعیدی ئەنساری بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرد. لەم ساڵەدا رۆمییەکان بۆ زێبتەرە ڕۆشتنەدەر کەقەلایەکی کۆنە و حەبیب کوڕی مەسلیمەی فێهری دەستی بەسەردا گرتبوو. رۆمییەکان ئەو قەلایان وێران کرد. چەندین بینای لەرزۆکیان لەوێ دروست کرد. رۆمیەکان گەڕانەوە و لەرۆژگاری (مەروانی کەر) دوایین خەلیفەی ئومەوییەکان، وێرانیان کرد. دواتر ڕەشید ئەو ناوچەی بەهێز و پیاوە

شەڕکەرەکانی لەوێ جێگیر کرد. کاتێك، مەئمون فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، رۆمییەکان هێرشیان کردەسەر و کاولیان کرد. مەئمون فەرمانی ئاوەدان کردنەوەیدا و دووبارە بەهێزیان کردووە. دووبارە رۆمییەکان لەسەردەمی موعتەسەم مەبەستی وێران کردنیان کرد. بەخواستی خواوەند لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین. لەبەر ئەوە گێڕانەوەیەکی گشتیم لێرەدا باس کرد چوونکە مێژووی رووداوەکانم نەدەزانی.

هەروەها لەم ساڵەدا وەلید، براکەی خۆی، عومەر کوڕی یەزیدی بۆ شەڕ ڕەوانە کرد و ئەسوەد کوڕی بیلالی موحازی کردە فەرماندەی هێزە دەریاییەکان و بۆ قیبرسی نارد تا رێگەی بۆخەڵکەکەی بکاتەوە بۆ ئەوەی رووبکەنە شام یا رۆم. دەستەیەك بەدراوسێیەتی موسوڵمانان رازی بوون و ئەوانیان بردە شام. دەستەیەك رۆمییان هەڵبژاردو بۆ ئەو دیارە بەرێکەوتن.

هەروەها لەم ساڵەدا، سلێمان کوڕی کەسیر، مالك، هەیسەم، لاهیز کوڕی قورەیز و قەحتەبە کوڕی شەبیب رۆشتنە مەککە و بەوتەی دەستەیەك لەمێژوو نووسان، چاویان بەمحەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی عەباس کەوت و داستانی ئەبوو موسایان لەگەڵ باس کرد و لەوەی بینیبوویان، ئاگاداریان کردەوە. وتی: ئازادە یا کۆیلە؟ وتیان: عیسا گومان دەکات کۆیلەیە و خۆی گومان دەکات ئازادەیە. دەڵێت: ئەویان کڕییەوە و ئازادیان کرد. دووسەد هەزار درەمیان بەمحەممەد کوڕی عەلیدا و جل و بەرگی سی هەزار درەمیان لەبەر کرد. بەوانی وت: گومان ناکەم چیتر بتوانن من ببینن، ئەگەر بەڵایەك بەسەر من هات، ئیبراهیمی کوڕم سەروەری ئێوەیە چوونکە پشتم بەو بەهێزە. پێشنیارتان پێدەکەم چاکەی لەگەڵ بکەن. ئەوان گەڕانەوە.

دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی عەباس لەزی قەعدە/ سێپتامبەر ٧٤٣ زایینی کۆچی دوایی کرد. ئەو، حەوت ساڵ دوای مەرگی باوکی مرد.

یوسف کوڕی محەممەد کوڕی یوسف، لەم ساڵەدا ئایینی حەجی ئەنجامدا. هەروەها لەم ساڵەدا نەعمان کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك لەهاویندا شەڕی کرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: ئەبوو حازمی ئەعرەج کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٤٠ یا ١٤٤/ ٧٥٧ یا ٧٦١ زایینی کۆچی دوایی کرد، سەماك کوڕی حەربق لەکۆتایی فەرمانڕەوایی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، قاسم کوڕی ئەبی بەزە کەناوی باوکی یەسارە و لەقورئان خوێنە بەناوبانگەکانە، ئەشعەس کوڕی ئەبی شەعسائی سولەیم کوڕی ئەسوەدی موحاربی، سەیید

کوڕی ئەبی ئونیسە جەزری موالی بەنی کەلاب یا موالی یەزید کوڕی خەتاب یا موالی غەنی لەتەمەنی ٤٦ ساڵی، پیاوێکی خۆپارێز و چاکەکار بوو، برایەکی بوو بەناوی یەحیا کەحەدیسە لاوازەکانی دەگێڕایەوە، عەرەجی شاعیر لەزیندانی محەممەد کوڕی هوشام کوڕی ئیسماعیل کارگوزاری هوشام کوڕی عەبدولەلیك لەمەدینە و مەککە. هۆکاری زیندانی کرانی ئەوە بوو لەیەکێك لەهۆنراوەکانی خۆی، سەرکۆنەی محەممەدی کرد. محەممەد کوڕی هوشام شوێنی کەوت تا ئەوەی بیستی یەکێك لەکۆیلەکانی ئەوی گرتووە و کوشتوویەتی و فەرمانی بەکۆیلەکانی خۆیداوە ژنی کۆیلە کوژراوە، پێشێل بکەن. محەممەد ئەوی گرت و ئەشکەنجەی کرد و لەبەرابەر خەڵکان، بەپێوە رایگرت. بۆ ماوەی نۆ ساڵ زیندانی کرد و لەزیندان، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و شەشی کۆچی (( ٧٤٤ زایینی ))

## کوژرانی خالید کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری

لەم ساڵەدا خالید کوڕی عەبدوالله کوژرا. هۆکاری لەسەر کار لابرانی ئەومان لەعێراق و خوراسان پێشتر باس کرد. وەك وتوویانە: پانزە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. کاتێك هوشام ئەوی لەسەر کار لابرد، یوسف کوڕی عومەر لەواست ئەوی گرت و زیندانی کرد. دواتر یوسف ڕۆشتە حیرە و خالیدی لەگەڵ خۆی برد و بۆ ماوەی هەژدە مانگ لەزینداندا هێشتییەوە. هەروەها براکەی ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله و کوڕەکەی، یەزید کوڕی خالید و برازاکەی، مونزەر کوڕی ئەسەدی زیندانی کرد. یوسف داوای فەرمانی لەهوشام کرد بۆ ئەوەی ئەشکەنجەی بکات. هوشام تەنیا بۆ یەکجار مۆڵەتی ئەو کارەی پێدا و سوێندی خوارد ئەگەر خالید بمرێت، بێ گومان یوسف دەکوژێت. یوسف ئەوی ئەشکەنجە و دووبارە ڕەوانەی زیندانی کرد. دەستەیەك دەڵێن: بەبەردەوامی ئەوی ئەشکەنجە دەکرد. هوشام لەشوالی ١٢١/ سێپتامبەری ٧٣٩ زایینی نامەی بۆ یوسف نووسی و فەرمانی ئازاد کردنی خالیدی پێدا. یوسف ئازادی کرد. خالید ڕۆشتە گوندێك لەنزیك روسافە و تا صەفەری ساڵی ١٢٢/ ژانویەی ٧٤٠ زایینی لەوێ مایەوە. زەید هاتەدەر و کوژرا و یوسف کوڕی عومەر نامەی بۆ هوشام نووسی: بەنی هاشم لەبرسیەتیدا دەمردن و زۆرترین هەوڵی هەرکام لەوان تێرکردنی سکی ماڵ و منداڵەکەی بوو. کاتێك خالید فەرمانڕەوایی عێراقی گرتەدەست سامانی لەناو ئەوان بڵاو کردەوە و لەبەر ئەمە خوازیار و تامەزرۆی فەرمانڕەوایەتی بوون. زەید تەنیا بەهۆی ئەندێشەی خالیدەوە، سەری بەرز کردەوە.

هوشام وتی: یوسف درۆ دەکات! نێردراوەکەی ئەشکەنجە و وتی: گومانمان لەخالید و گوێرایەڵی ئەو نییە.

خالید ئەمەی بیست و بەرێکەوت و لەدیمەشق دابەزی و بەگەشتێکی هاوینی ڕۆشت. فەرمانداری دیمەشق لەم کاتەدا کولسوم کوڕی عەییازی قوشەیری بوو کەخالیدی بەدوژمن دەزانی. لەم کاتەدا، شەوانە لەدیمەشق روداوی ئاگرکەوتنەوە ڕوویدەدا. پیاوێکی عێراقی ئاگری دەکردەوە کەپێیان دەوت کوڕی عەمرەس. کاتێك ئاگر هەڵدەگیرسا، دەڕۆشتنە سەر ماڵی خەڵکان و دزییان دەکرد. منداڵەکان و براکانی خالید، لەکەنار دەریا ژیانیان بەسەر دەبرد. کولسوم نامەی بۆهوشام نووسی کەکۆیلەکانی خالید دەیانەوێت هێرش بکەنە

سەرخەزێنە و لەبەر ئەمە شەوانە رووداوی ئاگرکەوتنەوە لەناو شاردا دروست دەکەن تا بەمەبەستەکەی خۆیان بگەن.

هوشام نامەی بۆنووسی و فەرمانی پێدا خالید و بنەماڵەکەی و هەموو کەسەکانی زیندانی بکات. ئەو کەسانێکی ڕەوانە کرد و منداڵ و براکانی خالیدی لەکەنار دەریا کۆکردەوە و زنجیری لەدەست وپێی ئەوان کرد. هاورێ لەگەڵ ئەوان، کۆیلەکان و ژن و کچ و خوشکەکانی، ئەوانیان برد. عەلی کوڕی عەمرەس و هاوەڵانی دەرکەوتن. وەلید کوڕی عەبدولرەحمان، کارگوزاری خەراج، نامەی بۆ هوشام نوسی و ئاگاداری کردەوە کەکوڕی عەمرەس و هاورێکانی دەستگیر کراون. ئاماژەی بەناو و هۆز و بنەماڵەکانی ئەواندا. لەناو ئەوان، کەس لەبنەماڵە و هۆزی خالید نەدەبینرا. هوشام نامەی بۆ کولسوم نووسی، سەرکۆنەی کرد و فەرمانی ئازاد کردنی خالید و کەسەکانی پێدا. ئەوانی ئازاد کرد و کۆیلەکانیان هێشتەوە بەو هیوایەی کاتێك خالید لەگەشتی هاوینەی بگەڕێتەوە، خوازیاری ئازادی ئەوان بێت.

خالید گەڕایەوە و لەماڵەکەی خۆی لەدیمەشق مایەوە. مۆڵەتی بەخەڵکاندا سەردانی بکەن. کچەکانی هەستان تا بڕۆنە ژوورەکانی خۆیان و لەبەر چاوی خەڵکان نەمێنن. بەوانی وت: خۆتان مەشارنەوە چوونکە هوشام هەموو رۆژێك دەتانباتە زیندان. خەڵك ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی ئەو و منداڵەکانی هەستان تا ژنەکان دابپۆشن. خالید وتی: من هاوشێوەی شەڕکەرێکی گوێرایەڵ و ملکەچ بۆ شەڕ دەڕۆشتم بەڵام ڕێزیان لەکارەکەی من نەگرت و ژن و منداڵەکانی منیان گرتو بەتاوانی گوناحێکی نەکردوو، ئەوانیان زیندانی کرد بەهەمان شێوە کەبتپەرستەکان زیندانی دەکەن. بۆ دەستەیەك لەئێوە هەڵنەستان و بڵێن: ئەم کۆیلە فەرمانبەرە گوێرایەڵەتان بەچ گوناحێك زیندانی کردووە؟ دەترسان هەمووتان بکوژرێن؟ خوا بەردەوام ترس لەدڵتانا بێڵێتەوە.

دواتر وتی: هوشام چ کارێکی بەمن هەیە؟ یا دەست لەمن هەڵبگرێت یا ئەوەی پێشنیاری شوێنکەوتنی ئەم پیاوە عێراقیەی نیشتەجێی شام و حیجازی نەژادە دەکەم ((محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس.) فەرمانتان پێدەدەم هوشام لەوتەکانی من ئاگادار بکەنەوە. کاتێك وتەکانی بەگوێی هوشام گەیشت، وتی: باوکی هەیسەم، خڵەفاوە.

نامەکانی یوسف کوڕی عومەر بەردەوام دەگەیشتە دەرباری هوشام و داوای یەزید کوڕی خالید کوڕی عەبدوالله‌ی لێدەکرد. هوشام کەسی بۆ لای کوڕی کولسوم ڕەوانە و فەرمانی

پێدا یەزید کوڕی خالید کوڕی عەبدوالله بۆ لای یوسف بنێرێت. کولسوم بەدوایدا گەڕا بەلام یەزید هەلات. خالیدی بانگ کرد و ڕۆشتە لای و یوسف زیندانی کرد. هوشام ئەمەی بیست و نامەی بۆ کولسوم نارد و سەرکۆنەی کرد و فەرمانی ئازاد کردنی خالیدی بەیوسفدا و ئازادی کرد.

لەرابردوودا بەو شێوە بوو کاتێك هوشام خوازیاری کارێك دەبوو، فەرمانی بەئەبرەشی کەلبی دەدا تا نامە بۆ خالید بنێرێت. ئێستا بەفەرمانی هوشام، ئەبەرش بۆی نووسی: سەرورەی باوەڕدارانیان ئاگادار کردۆتەوە کەپیاوێك بەتۆی وتووە: ئەی خالید، تۆم لەبەر دەگار خۆش دەوێت: خواوەند ڕێزدارە و تۆ ڕێزداری، خواوەند بەخشندەیە و تۆ بەخشندەی، خواوەند مێهرەبانە و تۆ مێهرەبانی (تا دەی بژارد) سەرورەی باوەڕداران سوێندی خواردوە ئەگەر ئەم هەواڵە ڕاست بێت، بێ چەند و چون دەتکوژێت.؟

خالید نووسی: لەو کۆڕەدا دەستەیەك بەو شێوە بوون کەهیچ کەس (لەخراپەکاران و کردار ناشیرینەکان) توانای بەلارێدا بردنی گێراوەکەی نەبوو. ئەو پیاوە بەمنی وت: خالید، تۆم لەبەر دەگار خۆش دەوێت: خواوەند ڕێزدارە و ڕێزدارەکانی خۆش دەوێت، خواوەند تۆی خۆش دەوێت و منیش، (تا دەی بژارد) کارێکی دژوارتر لەداستانەکەی من گەزادەی بەدبەختی حیمەیری لای سەرورەی باوەڕداران وتوویەتی: ئەی سەرورەی باوەڕداران، جێگری تۆ لەسەر بنەماڵەکەت لای تۆ بەرێزترە یا نێردراوی تۆ بۆ نیازەکانت؟ وتوویەتی: جێگری من بۆ سەر بنەماڵەکەم. زادەی بەدبەخت وتوویەتی: کەواتە تۆ جێگری خواییت و محەممەد نێردراوی خوایە. گومڕایی پیاوێك لەبووجەیلە (یانی خۆم) لای کۆمەلانی خەڵك شیاوترە بۆ ڕازی بوون تا گومڕایی سەرورەی باوەڕداران. کاتێك، هوشام نامەکەی خوێندەوە، وتی: باوکی هەیسەم، خڵەفاوە.

خالید تا کاتی مردنی هوشام لەدیمەشق مایەوە. وەلید هاتە سەر کار. نامەی بۆ نووسی: چارەنووسی ئەو پەنجا هەزار هەزارەی کەدەزانی، چی بەسەر هات؟ بۆ خەزێنەی سەرورەی باوەڕدارانی بگەڕێنەرەوە. خالید بۆ ئەو دیارە بەرێکەوت. لەناو خێوەتەکەی خۆیدا بوو کەوەلید کەسی ڕەوانە کرد و وتی: سەرورەی باوەڕداران دەفەرمێت: کوڕەکەت لەکوێیە؟ خالید وتی: لەشام هەلاتوە و ئێمە گومانمان دەکرد لەزیندانەکانی سەرورەی باوەڕداراندایە تا ئەوەی خواوەند، خەلافەتی بەئێوە بەخشی. کاتێك هەواڵی ئەومان دەستنەکەوت، گومانمان کرد بۆ سەرزەمینی خەڵکەکەی خۆی لەکوێستانەکانی سەرات هەلاتوە. نێردراو

گەڕایەوە و وتی: نا، بەمشێوە نییە، تۆ ئەوت لەشوێنی مانەوەی خۆت بەجێهێشت تا ئاژاوە بنێتەوە. وتی: سەرومری باوەڕداران دەزانێت، ئێمە بنەماڵەیەکی ملکەچ و گوێرایەڵین. نێردراو گەڕایەوە و وتی: سەروەی باوەڕداران دەڵێت: یا بێ چەند و چوون ئەو دەهێنیتە لای ئێمە، یا گیان دەخەمە سەر لێوت. خالید دەنگی خۆی بەرز کردەوە و وتی: ئەمە ئەو شتەیە کەمن دەخوازم. سوێند بەخواوەند، ئەگەر لەژێر قاچمدا بێت، قاچم بەرز ناکەمەوە. وەلید فەرمانی ئەشکەنجە کردنی ئەوی دەرکرد. ئەشکەنجەیان کرد بەڵام خالید هیچی نەوت. ئەویان خستە زیندان تا ئەو کاتەی یوسف کوڕی عومەر هاوڕێ لەگەڵ سامان و داراییەکان لەعێراقەوە هات و ئەوی بەپەنجا هەزار هەزار درەم لەوەلید کڕییەوە. وەلید پەیامی بۆ خالید نارد: یوسف تۆ بەپەنجا هەزار هەزار درەم دەکرێت، ئەگەر بەڵێن دەدەت ئەو برە پارەیە بدەیت، ئازادیت و گەرنە تۆ تەسلیمی ئەو دەکەم. خالید وتی: بیرم نایەت بتوانرێت عەرەبەکان، کڕین و فرۆشیان پێوە بکرێت. سوێند بەخوا ئەگەر داوا لەمن بکەیت، بەڵێنی گەڕانەوە تۆڵاشە دارێك بدەم، نایدەم. وەلید ئەوی بەیوسف سپارد. یوسف جلەکانی داکەند و عابایەکی دابەسەر شانیدا. سوار وشترێکی بێ کۆپانی کرد و ئەشکەنجەی دەدا. بەڵام خالید لێوی نەکردووە. ئەوی بردە کوفە و هەمان شەو ئەوی کوشت و لەحیرە بەخاکی سپارد. بەعاباکەیەوە خستیانە ژێر خاك. ئەم رودواوە لەموحەرەمی ١٢٦/ نۆڤەمبەری ٧٤٣ زایینی روویدا. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو، داری خستە نێوان ڕانی و فەرمانی بەپیاوەکانیدا بەسەریدا بڕۆن تا ئەوەی قاچیان ورد و خاش کرد. خالید ئەوتەیەکی هێنایە سەرلێو، نە رووی گرژ کرد.

دایکی خالید، ژنێکی مەسیحی بوو کەباوکی لەیەکێك لەجەژنە مەسیحیەکان، پەیوەندی هاوسەریەتی لەگەڵ بەست و خالید و ئەسەدی هێنایە دنیا بەڵام خۆی باوەڕی بەئیسلام نەهێنا. خالید پەرستشگەیەکی بۆ دروست کرد. شاعیران، بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەیان کرد. فەرزدق وتی:

الا قطع الرحمن ظهر مطية اتتنا تهادى من دمشق بخالد
فكيف يوم الناس من كانت امه تدين بان الله ليس بوواحد
بنى بيعة فيها النصارى لامه و يهدم من كفر منار المساجد

یانی: خۆزگە خواوەند پشتی ئەو وشترە بشکێنێت کە بەڕاکردن، لەدیمەشقەوە هات و خالیدی بۆ ئێمە هێنا. چۆن دەکرێت کەسێك پێشنوێژی خەڵك بێت کەدایکی باوەڕی بەفرە

خواوەندی هەیە؟ پەرستشگەیەکی مەسیحی بۆ دایکی دروست کرد بەڵام لەبەر ناباوەڕی گوڵدەستەی مزگەوتەکانی لەناو برد.

خالید فەرمانی وێران کردنی گوڵدەستەی مزگەوتەکانیدا چوونکە بیستبووی، شاعیرێك وتوویەتی:

لیتنی فی المؤذنین حیاتی انهم یبصرون من فی السطوح

فیشیرون اوتشیرو الیهم بالهوی کل ذات دل ملیح

یانی: خۆزگە سەراسەری ژیانم هاوشێوەی لۆتییەکان بەسەر دەبرد چوونکە ئەوان کەسانی سەر بانەکان دەبینن، یا بۆ پەری روخسارەکان دەست رادەوەشێنن یا هەر نازەنینێکی خوێنشیرین لەبەر شەیدایی، دەستیان بۆ رادەوەشێنێت.

کاتێك ئەم هۆنراوەی بیست، فەرمانی وێران کردنی ئەوانی دەرکرد. کاتێك بیستی خەڵکان بۆ دروست کردنی کەنیسەکە، سەرکۆنەی دەکەن، لەبەرابەر خەڵکان، داوای لێبووردنی کرد بەڵام لەبەر نەزانی بەمشێوەیە قسەی کرد: خواوەند ئایینەکەیان نفرین بکات. ئەگەر لەدینەکەی ئێوە خراپتر بێت. بەردەوام دەیوت: جێگری پیاو لەسەر بنەماڵەکەی، گەورەتر و رێزدارتر لەنێردراوی ئەوە. مەبەستی ئەوە بوو کەجێگر (هوشام) لەنێردراو (پێغەمبەر(د.خ) ) گەورەتر و رێزدارترە. لەم وتەیە، پەنا بۆ خوا دەبەین.

## کوژرانی وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك

لەم ساڵەدا، لەمانگی جەمادی الثانی/ ئاوریلی ٧٤٤ زایینی وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، کوژرا.

هۆکاری کوژرانەکەی، ئەو بابەتانە بوو پێشتر ئاماژەمان پێدا چوونکە ئەو پیاوێکی سەرسەری و هەرزە بوو. کاتێك لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، جگە لەزێدرۆیی کردن لەکارەکانی لەچێژ وەرگرتن و رابواردن و مەی خۆری و راو کردن و هاونشینی لەگەڵ خراپەکاران، شتێکی دیکەی لێنەبینرا. ئەم کارانە بۆ کۆمەڵانی خەڵك و سوپاکەی نەشیاو بۆ رازی بوون و پەسەند کردن بوو. هەموان کارەکانی ئەویان بەقێزەون و نارەوا ناو دەبرد. خراپترین کاری ئەوە بوو سەبارەت بەدوو کوڕە مامەکەی خۆی، هوشام و وەلید ئەنجامیدا. ئەو سلێمان کوڕی هوشامی گرت و سەد قامچی لێدا و سەری و ریشی تاشی و بۆ سەرزەمینی عەمان لەسەرزەمینەکانی شام دووری خستەوە و لەوێ زیندانی کرد. لەزیندان مایەوە تا ئەو

کاتەی وەلید کوژرا. کەنیزێك لەبنەماڵەی وەلیدی گرت. عوسمان کوڕی وەلید سەبارەت بەو کەنیزە، قسەی لەگەڵ کرد تا ئازادی بکەن. وتی: نایکەم. وتی: سوارەکان لەبەرابەر سوپاکەت ئامادە دەکەم. ئەفقەم یەزید کوڕی هوشامی گرت و لەنێوان روح کوڕی وەلید و هاوسەرەکەی جیایی دروست کرد و دەستەیەك لەمناڵەکانی وەلیدی خستە زیندانەوە. بەنی هاشم و بەنی وەلید وتیان ئەو ناباوەڕە و لەگەڵ ژنەکانی باوکی نزیکی دەکات. وتیان: سەد (جامیعە، بەند و زنجیری ئاسنینی) بۆ ئومەوییەکان هەڵگرتووە.

سەختگیرترین کەس لەبەرابەر ئەو، یەزید کوڕی وەلید بوو کەخەڵك زیاتر گوێیان لەوتارەکانی ئەو دەگرت چوونکە خۆپارێزی لەخۆی نیشاندەدا و کەسێکی لەخۆ بووردوو بوو. سەعید کوڕی بەیهەس رێگەی نەدا بۆ دوو کوڕەکەی حەکەم و عوسمان بەیعەت لەخەڵك وەربگرێت و وتی ئەم دووانە مناڵن و شیاوی خەلافەت نین. وەلید ئەوی خستە زیندان و لەزیندان هێشتیەوە تا ئەو کاتەی مرد.

داوای لەخالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسری کرد بۆ دوو کوڕەکەی بەیعەت وەربگرێت و خۆیشی بەیعەت ببەستێت. وتی: نایکەم. وەلید توڕە بوو. پێیان وت: رێگەی ناسازگاری لەگەڵ سەرورەی باوەڕداران مەگرەبەر. وتی: چۆن لەگەڵ کەسێك بەیعەت بکەم لەکاتێکدا لەپشت سەریەوە نوێژ ناخوێنم و بەشایەتییەکانی رازی نابم؟ وتیان: بەشایەتی وەلید بەم هەموو خراپەکاریەوە رازی دەبیت! وتی: سەرورەی باوەڕداران، لەمن دوورە و ئەمە قسە و باسی ناو خەڵکانە. یەمانییەکان پشتیان تێکرد و خەڵکانی قوزاعە ئەویان بەدوژمنی خۆیان دەزانی. ئەوان و یەمانییەکان زۆرینەی سوپاکەی شامیان پێکدەهێنا. حورەیس و شەبیب کوڕی ئەبی مالکی غەسانی و مەنسور کوڕی جمهوری کەلبی و کورە مامەکەی حیبال کوڕی عەمرۆ و یەعقوب کوڕی عەبدولرەحمان و حەمید کوڕی مەنسوری لەخمی و ئەسبەغ کوڕی زوالە و توفەیل کوڕی حارسە و سوری زیاد ڕۆشتنە لای خالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسری و داوایان لێکرد هاوکاریان بکات، بەڵام خالید رازی نەبوو.

وەلید مەبەستی حەجی کرد. خالید ترسا لەرێگادا بیکوژن و لەبەر ئەمە رێگەی ئەو کارەی لێگرت. پرسی: بۆ؟ خالید ئاگاداری کردەوە. لەبەر ئەمە ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و ئەوی زیندانی کرد و داوای سامان و داراییەکانی عێراقی لێکرد. یوسف کوڕی عومەری لەعێراقەوە بانگ کرد و داوای لێکرد سامانەکانی لەگەڵ خۆیدا بێنێت. ویستی لەسەر کار لایببات و عەبدولەلیك کوڕی محەممەد کوڕی حەجاج کوڕی یوسف بکاتە فەرمانڕەوا. یوسف

لەعێراقەوە هات و بەئەندازەیەك سامانی لەگەڵ خۆی هێنا كەهیچ كات بەو ئەندازەیە سامان لەعێراقەوە نەهێنرابوو.

حەسانی نبتی (حەییانی نبتی؟) ئەوی بینی و ئاگاداری كردەوە كەوەلید، دەخوازێت عەبدولمەلیك كوڕی محەممەد وەك فەرمانداری عێراق دەستینشان بكات. پێشنیاری پێكرد تا بەرتیلی گەورە بەوەزیرەكانی وەلید ببەخشێت. یوسف پێنسەد هەزار دیناری لەناو ئەواندا دابەش كرد. حەسان پێی وت: لەزمانی كارگوزارەكەت لەعێراق، نامەیەك بۆ وەلید بنووسە كە: ئەم نامەم لەكاتێدا نووسی كەجگە لەكۆشك، هیچم بەدەستەوە نەماوە. بەنامە سەر بەمۆرەكە، بڕۆ لای وەلید و خالیدی لێبكرە. ئەو كارەی كرد و وەلید فەرمانی پێدا بۆ عێراق بگەڕێتەوە. خالیدی قەسری بەپەنجا هەزار دینار لەو كڕی و یوسف پارەكەیدا. خالیدی سوار لەسەر وشترێكی بێ كۆپان، بۆ عێراق برد. یەكێك لەخەڵكانی یەمەن هۆنراوەیەكی لەقسەكانی وەلید هۆنییەوە و خەڵكانی یەمەنی دژی ئەو ڕاپەڕاند.

دەستەیەك دەڵێن: ئەمە هۆنراوەی وەلیدە كەخەڵكانی یەمەن بۆ هاوكاری نەكردنی خالید، سەركۆنەی دەكەن:

| | |
|---|---|
| الم تهتج فتذكر الوصالا | و حبلا كان متصلا فزالا |
| بلى فالد مع منك الى انسحام | كماء المزن ينسجل انسجالا |
| فدع عنك ادكارك آل سعدى | فنحن الاكثرون حصى و مالا |
| و نحن المالكون الناس قسرا | نسومهم المذلة و النكالا |
| و طئنا الا شعرين بعز قيس | فيالك و طاء لن تستقالا |
| و هذا خالد فينا اسير | الا منعوه ان كانوا رجالا |
| عظيمهم و سيدهم قديما | جعلنا المخزيات له ظلالا |
| و لا تركوه مسلوبا اسيرا | يعالج من سلاسلنا الثقالا |
| و كندة و السكون فما استقالوا | و لا برحت خيولهم الرحالا |
| فما سمنا البرية كل خسف | و هدمنا السهولة و الاجبالا |
| فما زالوا ابدا لنا عبيدا | نسومهم المذلة و السفالا |
| فاصبحت الغداة على تاج | لملك الناس ما يبغى انتقالا |

یانی: ئایا نەكەوتیتە جۆش تا ڕۆژگاری هاوئامێزی بیر بێنیتەوە؟ ڕشتەیەك كەپەیوەست بوو، پچڕا. بەڵێ، جوان لەبیرتە كەبارانی فرمێسك لەچاوەكانت دەبارێت

هاوشێوەی هەورێکی پڕ کەیەك سات لەبارین ناوەستێت. بەڵام ئێستا بیرکردنەوەی بنەماڵەی سەعدی لەبیربکە چوونکە لەروانگەی ژمارە و دارایی، لەوان فراوانترین. ئێمەین بەزۆر فەرمانڕەوایی بەسەر خەڵکدا، دەکەین و تامی ریسوایی و لاوازیان پێ دەچێژین. بەشکۆی قەیسیەکان، پێ دەخەینە سەر سەری ئەشعەرییەکان و ئەمە هەنگاوێکە هیچ کات ناتوانرێت، دووری بکەنەوە. هەنووکە خالید لەدەستی ئێمەدا دیلە، ئەگەر پیاو بوون، بۆ پارێزگاریان لێنەکرد؟ گەورە و رێبەری ئەوان بوو و ئێمە سایەوانی ریسواییمان بۆ دروست کرد. ئەگەر ئەو هۆزانە بەرێز و شکۆدار دەبوون، پەروەردگار، گومرایی نەدەکردن. هەروەها خالیدیان بەمشێوەیە بێ چەك و سیلاح و جل و بەرگ بەجێنەدەهێشت تا زنجیرەکانی ئێمە زەخت لەدەست وپێی بکات. هۆزی سەکون و کیندە، لەشوێنی خۆیان نەجووڵان و ئەسپەکانیان بەستراوە و چوارپێکانیان بێ جووڵە وەستاون. بەئەسپە تیژپێ و چالاکەکان، خەڵکانمان ریسوا کرد، تامی گیانبڕمان پێ چێشتن، گمیزمان کرد و دەشت و کێوەکانمان ژێرورووکرد. بەڵام شەڕە قورسەکان ئەوانی تێکشکاندوە و بۆ پاشەکشێ ناچاری کردون بەشێوەیەك مردوو لەبەردەم دەست و پێی ئەوان بەجێ دەمێنێت. هەمیشە هاوشێوەی کۆیلەکانن و ئێمە پیاڵەی ریسوایی ئەوان هەڵدەدەین. کاتێك لەبەردبەیاندا چاوەکانم کردەوە، بینیم تاجێکم لەسەرە کەناخوازێت لەشوێنەکەی خۆی هەڵبگیرێت.

ئەم وتانە بۆ ئەوان دژوار و نەشیاو بۆ رازی بوون بوو بەشێوەیەك کەمەبەستی کوشتنی ئەو و رق و کینەی ئەوان، زیادی کرد. حەمزە کوڕی بەیز سەبارەت بەوەلید وتی:

| | |
|---|---|
| وصلت سماء الضر بالضر بعد ما | زعمت سماء الضر عنا ستقلع |
| فليت هشاما كان حيا يسومنا | و كنا كما كنا نرجی و نطمع |

یانی: لەروانگەی بەدبەختی و خاکەساری، بۆ شوێنێکی دوور ڕۆشتوویت و ئەمە دوای ئەوە بوو کەگومانت کرد ئاسمانی بەدبەختی چیتر لەسەر سەرمان نامێنێت. خۆزگە هوشام دەبوو و ئێمە بەردەوام چێژمان لەئارەزوو و هیواکانمان دەبرد.

هەروەها وتی:

| | |
|---|---|
| يا وليد الخنا تركت الطريقا | و اضحا و ارتكبت فجا عميقا |
| و تماديت و اعتديت و اسرف | ت و اغريت و انبعثت فسوقا |
| ابدا هات ثم هات و هاتی | ثم هاتی حتی تخر صريعا |
| انت سكران ما تفيق فماتر | تق فتقا و قد فتقت فتوقا |

یانی: ئەی وەلیدی بەدبەخت، لەرێگە بەدەر بوویت و بەئاشکرا گومڕا و کەوتیتە ناو دۆڵێکی قووڵ. لەگومڕاییدا ڕۆچوویت، کەسانی دیکەت هاندا و کارە فێڵەمونەکانت زیندوو کردەوە. هەرگیز، بۆ پێش وەرە، وەرە تا بێ گووێ و هۆش، بکەویتە سەرزەوی. تۆ مەستی، نەدەتوانی کەلێنەکان پڕ بکەیتەوە، نەتوانای چاککردنەوەی ئەم هەموو پچڕانەت هەیە.

خەڵکانی یەمەن ڕۆشتنە لای یەزید کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك و پێشنیاریان کرد تا لەبەرژەوەندی خۆیان (بۆ خەلافەتی خۆی) بەیعەت لەوان وەربگرێت. ئەو لەگەڵ عەمرۆ کوڕی یەزیدی حەکەمی راوێژی کرد. عەمرۆ پێی وت: نابێت خەڵك بەمشێوەیە بەیعەت لەگەڵ تۆ ببەستن، لەگەڵ عەباسی برات راوێژ بکە. ئەگەر دژایەتی تۆی نەکرد، کەس دژایەتی تۆ ناکات، ئەگەر رازی نەبوو، خەڵك زیاتر گوێرایەڵی ئەو دەبن. ئەگەر دەتەوێت بێ چەند و چوون، درێژە بەم بیرۆکەیە بدەیت، بەجۆرێك خۆت نیشانبدە کەعەباسی برات بەیعەتی لەگەڵ کردوویت. شام، گیرۆدەیەی نەخۆشیەکی کوشندە بوو و خەڵك روویان لەدەشت و کێوەکان کرد. عەباس لەقەستەل بوو و یەزید لەدەشت. لەنێوان ئەم دووانە، چەند میل ڕێگە بوو نەزۆر دوور. یەزید ڕۆشتە لای عەباسی برای و راوێژی لەگەڵ کرد. عەباس ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت. ئەو گەڕایەوە و بەنهێنی بەیعەتی لەخەڵکان وەرگرت و نێردراوانی خۆی بۆ سوج و کەنارەکان نارد. نێردراوان، خەڵکیان بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵ ئەو هاندەدا. جارێکی دیکە ڕۆشتە لای عەباسی برای و بیروراکانیان گۆڕییەوە و پێشنیاری پێکرد شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بێت. عەباس نارازی و وتی: ئەگەر، جارێکی دیکە ئەو کارە بکەیت، زنیجر لەدەست وپێ، تەسلیمی سەروەری باوەڕدارانت دەکەم. یەزید هاتەدەر و عەباس وتی: گومانم وایە ئەمە شوومترین منداڵی مەروانییەکانە.

ئەم هەواڵە بەمحەممەد کوڕی مەروان گەیشت کە لەئەرمەنستان ژیانی بەسەر دەبرد. نامەی بۆ سەعید کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان نووسی و فەرمانی پێدا ڕێگەی ئەو کارە لەخەڵکان بگرێت و لەئازاوە بیانترسێنێت و ئاگاداریان بکاتەوە لەئەگەری درێژەدان بەم کارە، خەلافەتیان لەدەستا نامێنێت. سەعید ئەم کارەی بەناپەسەند و نامەکەی بۆ عەباس کوڕی وەلید ڕەوانە کرد. عەباس، یەزیدی بانگ کرد و ئاگاداری کردەوە. یەزید کارەکانی خۆی لەو دەشاردەوە و عەباس ئەوی بەراستگۆ زانی. عەباس بەبراکەی بشر کوڕی وەلیدی وت: ئەی مەروانییەکان، گومان دەکەم، خواوەند فەرمانی لەناو بردنی ئێوەی دەرکردبێت. دواتر ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان:

| | |
|---|---|
| انی اعيذكم ابلله من رفتن | مثل الجبال تسامی ثم تندفع |
| ان البرية قد ملت سياستكم | فاستمسكوا بعمود الدين و ارتدعوا |
| لا تلعمن نئاب الناس انفسكم | ان الذئاب اذا ما الحمت رتعوا |
| لا تبقرن بايديكم بطونكم | فثم لا حسرة تغنی و لا جزع |

یانی: پەناتان دەدەم بەخواوەند لەو ئاژاوانەی هاوشێوەی کێوەکان سەر بەرز دەکەنەوە و بۆ پێشەوە دێن. خەڵکانی جیهان لەچۆنیەتی فەرمانڕەوایی ئێوە بێزار بوون، کەواتە پشت بەکۆڵەکەی دین ببەستن و لەخراپەکاری و ستەمکاری دەست هەڵگرن. گۆشتی خۆتان دەرخواردی گورگی خەڵکان مەدەن چوونکە کاتێك گورگەکان بانگێشتی میوانی دەکرێن، نەترسانە، ورگی خۆیان تێر دەکەن. ورگی خۆتان بەدەستی خۆتان هەڵمەدڕن چوونکە کاتێك جڵەوی کارەکانتان لەدەستا نەما، نەشین سوودی هەیە، نەداخ و پەشیمانی.

کاتێك کاروبارەکان بۆ یەزید جێگیر بوو(هێشتا لەدەشت بوو)) رووی کردە دیمەشق. دووری ئەو لەشارەکە، چوار رۆژ رێگە بوو. بەشێوەیەکی نەناسراو لەگەڵ حەوت کەس لەحەمیرییەکان ڕۆشتە ناوشارەکە. لەجەرود دابەزین کەمەنزڵێك لەدیمەشقەوە دوورە. بەرێکەوتن و ڕۆشتنە ناو دیمەشق کەزۆربەی خەڵکەکەی بەشێوەیەکی نهێنی بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو. خەڵکانی موزەیش بەیعتیان دابوو. عەبدولەلیك کوڕی محەممەد کوڕی حەجاج، فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی دەکرد. لەنەخۆشییە کوشندەکە ترسا و رووی کردە دەشت و لەقەتن دابەزی و کوڕەکەی وەك جێگری خۆی لەشارەکە دەستنیشان کرد. سەرپەرەستی پاسەوانەکانی، باوکی عاج کەسیر کوڕی عەبدوواللەی سولەمی بوو. یەزید مەبەستی ئەوەی کرد بەشێوەیەکی ئاشکرا بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت، شەڕ دەستپێبکات. بەفەرمانداریان وت: یەزید مەبەستی شۆرشی هەیە، بەڵام بەم وتانە رازی نەبوو.

شەوی هەینی دوای نوێژی ئێوارێ، یەزید فەرمانی ئامادەبوونی بەهاوەڵانیدا. ئەوان هاتن و لەدەروازەی فەردایس لەسەر رێگە دانیشتن تا ئەوەی بانگی خەوتنانی دا. ڕۆشتنە ناو مزگەوت و نوێژیان خوێند. چەندین کەس پاسەوانی مزگەوتیان دەکرد و فەرمانیان پێدرابوو، شەوانە رێگە نەدەن کەس لەمزگەوتا بمێنێتەوە. یارانی یەزید چاوەڕوان بوون تا ئەو کاتەی تەنیا پاسەوانەکان لەمزگەوتەکەدا مانەوە. پاسەوانەکانیان گرت. یەزید کوڕی عەنبەسە، ڕۆشتە لای یەزید کوڕی وەلید و ئاگاداری کردەوە. دەستی گرت و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەستە! مژدەی هاوکاری خوایی و سەرکەوتنت لێ بێت. یەزید هەستا

و لەگەڵ دوانزە کەس لەهاوەڵانی خۆی بەرێکەوت. کاتێك لەبازاری (کەرفرۆشەکان) نزیك کەوتنەوە، چاویان بەچل کەس لەپیاوەکانی خۆیان کەوت و نزیکی دوسەد کەسی دیکە پەیوەستیان بوون. ڕۆشتنە ناو مزگەوت و دەرگای مەقسوریان گرت. لەوانیاندا. وتیان: نێردراوەکانی وەلیدین. خزمەتکار دەرگای بۆ کردنەوە. ئەویان گرت و ڕۆشتنە ناو و باوکی عاجیان قۆلبەست کرد کەسەرخۆش بوو. پاسەوانەکانی خەزێنەیان دەستبەسەر کرد. لەهەر کەس دەترسا، چەند کەسێکی بۆ دەستگیری کردنی ئەو ڕەوانە دەکرد. محەممەد کوڕی عوبەیدەی گرت کەفەرمانداری بەعلەبەك بوو. منداڵەکانی عوزرەی بۆ دەستگیری کردنی محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی حەجاج ڕەوانە و ئەویشیان گرت.

کەرەستەی شەڕی زۆریان لەمزگەوتەکە، دۆزییەوە. کاتێك بەرەبەیان هەڵهات، خەڵکانی مەزە هاتن و کەسانی دیکە دەستە لەدوای دەستە، پەیوەستیان دەبوون. ئەم کەس و خەڵکانە پەیوەستی بوون: خەڵکی سەکاسێك، خەڵکی داریا، یەعقوب کوڕی محەممەد کوڕی هانی عەبەسی، عیسا کوڕی شەبیبی تەغلەبی هاوڕێ لەگەڵ خەڵکانی دومە ئەلجەندەل و حەرەستا، حومەید کوڕی حەبیبی نەخەعی لەگەڵ خەڵکی دێری موڕان و ئەرمزە و سەترا، خەڵکی جەرەش، خەڵکی حەدیسە، خەڵکی دێری زەکا، بەعی کوڕی هاشمی حارسی لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی سەلامان و بەنی عوزرە، خەڵکانی جوهەینە لەگەڵ دۆستان و هاوپەیمانەکانی خۆیان.

یەزید کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك، عەبدولرەحمان کوڕی موسادی لەگەڵ دوسەد پیاوی شەڕکەر ڕەوانە کرد تا عەبدولمەلیك کوڕی محەممەد کوڕی یوسف، لەکۆشکەکەی بێنەدەر و بیبەن بۆ لای ئەو. شەڕکەرانی وەلید، بەبەخشینی ئەمان، ئەویان گرت. عەبدولرەحمان دوو باردانی دۆزییەوە کە هەرکامیان، سی هەزار دیناری تیا بوو. پێیان وت: یەکیان هەڵبگرە بۆ خۆت. وتی: دەترسم عەرەبەکان داستانەکان دروست بکەن کەیەکەم دەغەڵکار، لەم کارەدا بووم.

یەزید سوپای ڕازاندەوە و ئاڵای بۆ بەستن و ئەوانی بۆ شەڕی وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، ڕەوانە کرد عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج کوڕی عەبدولمەلیکی کردە فەرماندەی ئەوان.

کاتێك یەزید، لەدیمەشق فووت بوویەوە، کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی وەلید ڕۆشتە لای و ئاگاداری کردەوە. ئەو لەئەغدەف لەشاری عەممان بوو. وەلید ئەشکەنجەی کۆیلەکەی کرد و

ئەوی خستە زیندان. باوکی محەممەد عەبدوڵلە کوڕی یەزید کوڕی معاویەی بۆ دیمەشق نارد. بەرێکەوت و بەشێك لەرێگەی بڕی و دواتر لەشوێنێك مایەوە. یەزید کوڕی وەلید، عەبدولرەحمان کوڕی موسادی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. باوکی محەممەد سەرەتا پرسیاری چۆنیەتی کاروبارەکانی کرد و دواتر لەگەڵ یەزید کوڕی وەلید بەیعەتی بەست.

کاتێك ئەم هەواڵە بەوەلید گەیشت، یەزید کوڕی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە پێی وت: بەرێکەوە و لەحمص دابەزە چوونکە قەڵایەکی بەهێزە. سوارەکان بۆ شەڕی یەزید ڕەوانە بکە تا بیکوژن یا دیلی بکەن. عەبدوڵلە کوڕی عەنبەسە کوڕی سەعید کوڕی عاص پێی وت: شیاو نییە بۆ خەلیفە پێش دەسپێکردنی شەڕ، سوپاکەی یا بنەماڵەکەی خۆی بەجێبێڵێت و بڕوات. خواوەند هاوکاری سەروەری باوەڕدان دەکات و سەرکەوتنی پێدەبەخشێت. یەزید کوڕی خالید وتی: ئێمە ترسی ئەوەمان نییە کەس دەستی بەژن و منداڵ و ژنانی ناو حەرەمسەراکەی ئەو بگات، چوونکە ئەو کەسەی هێرشی کردۆتە سەر ئەوان، عەبدولعەزیز، کوڕە مامی ئەوانە.

گوێی لەوتەکانی عەنبەسە گرت و بەرێکەوت تا گەیشتە کۆشکی بەخرا (کۆشکەکەی نەعمان کوڕی بەشیر). لەمنداڵەکانی زوحاك کوڕی قەیس، چل کەس هاوڕێیەتی ئەویان دەکرد. وتیان: کەرەستەی شەڕمان پێ نییە، باشترە فەرمان بدەیت تا کەرەستەی شەڕمان پێبدەن. هیچی بەوان نەدا. عەبدولعەزیز شەڕی لەگەڵ کرد. عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك نامەی بۆ وەلید نووسی: بۆ لای تۆ دێم. وەلید وتی: تەختێك بهێننە دەر. لەسەر تەختەکە دانیشت و چاوەڕوانی عەباسی دەکرد. عەبدولعەزیز هاوڕێ لەگەڵ مەنسور کوڕی جمهور بۆ شەڕی ئەوان بەرێکەوت. عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج، زیاد کوڕی حوسەینی کەلبی بۆ لای ئەوان نارد تا پێشنیاری گەڕانەوە بۆ نووسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەریان پێبکات. هاوەڵانی یەزید ئەویان کوشت و بەو پەڕی هێزەوە، شەڕیان دەستپێکرد. وەلید ئەو ئاڵایەی بەست کەمەروان کوڕی حەکەم لەکاتی هاتنەدەر لەجابییە، هەڵیکرد.

عەبدولعەزیزیان ئاگادار کردەوە کەعەباس بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی وەلید بەرێکەوتووە. مەنسور کوڕی جمهوری بۆ سەر ڕێگەی ئەو ڕەوانە کرد کەبەزۆر گرتی و بۆ لای عەبدولعەزیزی برد. عەبدولعەزیز پێی وت: لەگەڵ یەزیدی برات بەیعەت بکە. بەیعەتی کرد و لەشوێنی خۆی وەستا. ئاڵایەکیان هەڵکرد و وتیان: ئەمە ئاڵای عەباسە کە لەگەڵ

سەرومری باوەڕداران بەیعەتی کردووە. عەباس وتی: پەنا بەخوا، ئەمە لەفریوەکانی شەیتانە، مەروانییەکان لەناو چوون. خەڵك لەدەوری وەلید بڵاوەیان لێکرد و لەدەروی عەباس و عەبدولعەزیز کۆبوونەوە. ولید کەسی بۆ لای عەبدولعەزیز ڕەوانە کرد و پێشنیاری پەنجا هەزار دینار و فەرمانداری هەمیشەیی حمس و چاوپۆشی کردن لەهەموو ڕووداوەکانی پێکرد و خوازیار بوو دەست لەدژایەتی کردنی ئەو هەڵبگرێت. عەبدولعەزیز ڕازی نەبوو و وەڵامی نەدایەوە. وەلید دوو زرێی پۆشی و فەرمانیدا هەر دوو ئەسپەکەیان ((سندی) و ((رایت)) بۆ هێنا. سوار بوو و بەو پەڕی هێزەوە، شەڕی کرد. پیاوێك ئەوانی بانگ کرد: دوژمنی خواوەند بکوژن. بەهەمان شێوە کەخەڵکی لوت لەناو چوون، لەناوی ببەن. بەردبارانی بکەن! کاتێك وەلید ئەمەی بیست، گەڕایەوە بۆ ناو کۆشکەکەی و دەرگای لەسەر خۆی بەست. وتی:

| | |
|---|---|
| دعوا لی سلمی و الطلاء و قینة | و کاسا الاحسبی بذلك مالا |
| اذا ما صفی عیشی برملة عالج | و عانقت سلمی ما ارید بدالا |
| خذوا ملککم لا ثبت الله ملککم | ثباتا یساوی ما حییت عقالا |
| و خلوا عنانی قبل عیر و ما جری | و لا تحسدونی ان اموت هزالا |

یانی: دولبەرەکەم، سەلام بۆ بانگ بکەن و کچێکی جوانی گۆرانیبێژ بێنن، قاپێك لەشەرابی کۆن. کاتێك ژیانی من لەگوڵزاری عالج، بەرەو خۆشی بڕوات و دەست لەئامێزی سەلما گیر بکەم، هیچ شتێکی دیکەم ناوێت. پاشایەتی خۆتان بۆ خۆتان و بەهێزی بکەن هیوادارم خواوەند پاشایەتیتان بەهێز نەکات چوونکە تا من زیندووم، بەئەندازەی پووشێك گرنگی پێنادەم. جڵەوی ئەسپەکەی من پێش هاتنی کاروان، بەرەڵا بکەن. ڕێگە بدەن، چی ڕوودەدات، ڕووبدات و ئەگەر بەهەژاری و ڕەنجدا مردم، رژدیم پێ نەبەن.

کاتێك ڕۆشتە ناو و دەرگای لەسەر خۆی بەست، عەبدولعەزیز گەمارۆی خستەسەر. وەلید لێی نزیك کەوتەوە و وتی: ئایا پیاوێکی ڕێزدار لەناو ئێوەدا نییە؟ ئایا خاوەن نەژادێکی شەرمێون لەناو ئێوەدا نییە، گفتوگۆی لەگەڵ بکەم؟ یەزید کوڕی عەنبەسەی سەکسەکی وتی: لەگەڵ من گفتوگۆ بکە. وەلید وتی: ئەی برای سەکاسەك، مەگەر من بەخششەکانی ئێوەم زیاد نەکرد؟ مەگەر خەرجییەکانم لەسەر ئێوە هەڵنەگرت؟ مەگەر هەژارەکانتانم لەهەژاری رزگار نەکرد؟ مەگەر نۆکەرەم بۆ پەککەوتەکانتان دیاری نەکرد؟ وتی: ئەوەی لەدڵماندایە، بۆ خۆمان نییە، بۆیە ئەو بەڵایەت بەسەر دەهێنین چوونکە ڕێزی

پەروەردگارت شکاند، شەرابت خواردەوە و لەژنەکانی باوکت نزیك بوویتەوە و گرنگیت بەفەرمانەکانی خواوەند نەدا. وتی: برای سەکسەکی، تەواوی کە، چوونکە سوێند بەگیانی خۆم زۆرت وت و خەفەت کردم. ئەوەی خواوەند ڕەوای کردووە، هۆکارێکە بۆ فراوانی. بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، قورئانێکی هەڵگرت و دەستی بەخوێندنەوە کرد، وتی: چارەنووسێك هاوشێوەی چارەنووسی عوسمان.

بەدیوارەکەدا هەڵگەڕان. یەکەم کەس کەبەدیوارەکەدا هەڵگەڕا، یەزید کوڕی عەنبەسە بوو. ڕۆشتە لای، دەستی گرت و مەبەستی ئەوەی کرد زیندانی بکات. لەم کاتەدا دە کەس هاتەدەر کەمەنسور کوڕی جمهور و عەبدالسەلامی لەخمی لەناو ئەواندا دەبینران. عەبدولسەلام بەگورز لەسەریدا و سندی کوڕی زیادی کوڕی ئەبی کەبشە لەقەیەکی لەروخساریدا و کوشتی. سەریان بڕی وبۆ یەزیدیان برد.

کاتێك سەری بڕاویان بردە لای یەزید کەنانی نیمەڕۆی دەخوارد. سەری لەخاك سوو و کوڕنوشی بۆ خواوەند برد. یەزید کوڕی عەنبەسە دوایین وتاری ئەوی پێوت: خواوەند پچڕانەکانی ئێوە چاك نەکاتەوە، بڵاوبوونەوەی ئێوە، کۆنەکاتەوە و وتەکانی ئێوە نەکاتە یەك. یەزید فەرمانیدا و سەریان بەڕمێکەوە کرد. یەزید کوڕی فەروە موالی بەنی مورە وتی: تەنیا سەری بڕاوی خەواریج دەکەن بەڕم وپیشانی خەڵکانی دەدەن. ئەمە کوڕە مامی تۆیە و خەلیفە نومەوییەکانە. دڵنیام ئەگەر بەو شێوەیە نیشانی خەڵکانی بدەیت، دڵیان بۆی دەسووتێت و ئاگری ڕق و کینەی ئەوان دادەگیرسێنیت. گوێ لەو نەگرت و سەری ئەوی بەڕمەوە کرد و بەشاری دیمەشقدا گەڕاندی. دواتر فەمانیدا بیدەن بەبراکەی سلێمان کوڕی یەزید. کاتێك سلێمان بینی، هاواری کرد: دوور بێت، شایەتی دەدەم کەپیاوێکی خراپەکار و شەرابخۆر بوو. ئەو مەبەستی کوشتنی منی کرد. سلێمان یەکێك بوو لەوکەسانەی بۆ لەناو بردنی ئەو هەوڵی دەدا.

یەزید، مالك کوڕی ئەبی سەمح گۆرانیبێژ و عەمود کوڕی وادی گۆرانیبێژ، هاورێیەتیان دەکرد. کاتێك هاوەڵانی یەزید، لەدەوری ئەو بڵاوەیان کرد و سوپاییەکان گەمارۆیان خستەسەر، مالیك کوڕی عەمرۆ پێی وت: با بڕۆین. عەمرۆ وتی: ئەمە وەفاداری نییە، ئێمە کەسێك نین مەبەستی کوشتنی ئێمە بکەن چوونکە شەڕکەر نین. مالك پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر دەستیان بەمن و تۆ بگات، پێش هەر کەسێك دەمانکوژن. سەری ئەو دەخەنە ناو سەری ئێمە و دەڵێن: بزانن، لەدوایین ساتەکان، چ کەسانێك هاورێیەتیان دەکرد. ئەمە

دەبێتە گەورەترین گوناح بۆ ئەو. ئەم دووانە هەلآتن.

کوژرانی ئەو، دوو شەو بۆ کۆتایی جمادی الپانی ساڵی ١٢٦/ ١٦ ئاوریلی ٧٤٤ زایینی روویدا. رۆژگاری خەلافەتی ئەو، ساڵێك و سێ مانگ، یا ساڵێك و دوو مانگ و بیست و دوو رۆژ بوو. ساڵەکانی ژیانی ٤٢ یا ٣٨ یا ٤١ یا ٤٨ ساڵ درێژەی کێشا.

## نەژادی وەلید و شێوازی کردەوەکانی

نەژادنامەی وەلید بەمشێوەیە: وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی عاس کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبدمەناف ئومەوی. نازناوەکەی باوکی عەبباسە، دایکی، کچی حەجاج کوڕی محەممەد کوڕی یوسفی سەقەفیە. ئەم ژنە خوشکەزای حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفییە. دایکی ئەم ژنە دایکی کولسوم کچی عەبدوالله کوڕی عامر کورەیزە. دایکی عامر کوڕی کورەیز، دایکی حەکیم بەیزا کچی عەبدولموتەلیبە. لەبەرە ئەمە بوو وەلید جارێك وتی:

نبی الهدی خالی و من یك خاله          نبی الهدی یقهر به من یفاخره

یانی: پێغەمبەری رێنیشاندەر، خاڵی منە، وکەسێك کەخاڵی پێغەمبەری رێنیشاندەر بێت، لەکاتی شانازی کردن بەسەر خەڵکان، لەهەموویان گەورەترە.

وەلید لەگەنجەکان و وردبینەکان و بووێران و بەخشەران و بەهێزەکانی منالەکانی ئومەییەیە. لەگەمەکردن و شەرابخۆری و گۆرانیبێژی نوقم ببوو. لەم بووارەدا کاری زۆری کرد کەبووە هۆکاری کوژرانی. یەکێك لەهۆنراوە جوانەکانی ئەمەیە کە، کاتێك بیستی، هوشام دەیەوێت لەسەر کار لایببات، وتی:

کفرت یدا من منعم لو شکرتها          جزاك به الرحمان ذو الفضل و المن

یانی: سپاسی دەستێکی بەخشەرت نەکرد و ئەگەر سپاست دەکرد، خواوەندی رەحمان، پاداشتی چاکەی دەدایتەوە.

چوارینەکانی پێشتر ئاماژەی پێدرا. شاعیرەکان لەهۆنراوەکانی خۆیان سەبارەت بەجوان پەرەستی و سکالآ کردن لەدلدار و وەسف کردنی شەراب.... دەدوێن و زۆر شتی ورد و ناسکیان لەو دزیوە. بەتایبەت باوکی ئەواس کەزۆر لاسایی ئەوی کردۆتەوە.

وەلید دەڵێت: خۆشەوستی بۆ ئاهەنگ و گۆرانی دەبێتە هۆی خوازیار بوون بەچێژ وەرگرتن و پیاوەتی دەمرێنێت و جێگەی شەراب دەگرێتەوە و سەرخۆش دەکات. ئەگەر

بەناچاری دەتانەوێت، بخوێنن و بژەنن، ژنەکانتان لەم کارە بەدوور بگرن چوونکە گۆرانی خوێندن تەڵە و دانی جوان روخسارانە.. من ئەمە لەسەر زمانی خۆم دەڵێم کە لەهەر چێژێك بۆ من خۆشترە و بۆ من لەهەر ئاوێکی فێنك، فێنکترە. بەڵام باشترە پیاو روو لەراستی و دروستی بکات. دەڵێن: یەزید کوڕی مونبە موالی سەقیف، وەلیدی وەسف و لەکاتی خەلافەت، پیرۆزبایی لێکرد. وەلید فەرمانیدا، دێرەکانی هۆنراوەکەی بژمێرن و بۆ هەر دێرێك، هەزار درەمی پێببەخشن. دێرەکانی هۆنراوەکەیان بژارد و پەنجا دێر بوو. پەنجا هەزار درەمیان پێبەخشی. ئەو یەکەم خەلیفەیە بۆ هەر دێرێك هەزار درەمی بەخشی.

لەو داستانانەی لەهەموو شوێنێك وێردی سەر زمانە، ئەوەیە کە، کاتێك قورئانی کردەوە، فاڵی گرتەوە. ئەم ئایەی دەرهات: بەدوای بەخشین و فراوانیدا گەڕان و هەر ستەمکارێکی یاخی بەرەو لەناوچوون ڕۆشت (ابراهیم/١٤/١٥) قورئانەکەی فڕێدا، تیری لێدا و وتی:

تخا طبنی بجبار عبید          فها انا ذاك جبار عنید

اذا ما جئت ربك یوم حشر          فقل یارب مزقنی الولید

یانی: من بەیاخی ستەمکار ناو دەبەیت، ئێستا ئەو ستەمکارە، یاخییەم. کاتێك رۆژی هەستانەوە ڕۆشتیتە لای پەروەردگار، بڵێ، وەلید منی لەت لەت کرد.

زۆری نەخایاند وەلید کوژرا.

یەکێك لەوتەجوانەکانی ئەمەیە: کاتێك مەسلەمە کوڕی عەبدولەلیك مرد، هوشام پرسەی بۆ گێڕا. وەلید کەمەست و سەرخۆش بوو، ڕۆشتە لای و عاباکەی بەسەر زەویدا رادەکێشا. لای هوشام وەستا، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کۆتایی هەر کەسێك، پەیوەست بوون بەرابردووی رۆژگارە، دوای مەسلەمە، نێچیر بۆ راو کەمی کردووە و سنورە بەهێزەکان لاواز بوون، بەپێی رابردوو هەڵس و کەوت دەکات ئەو کەسەی بەختەوەر و کامیارە ((توێشوی فراوان کۆبکەنەوە چوونکە خۆپارێزی باشترە لەهەر کارێك )(بقرە / ٢/ ١٩٧). هوشام پشتی تێکرد و وەڵامی نەدایەوە. خەڵك دوای وتەکانی ئەو بێدەنگ بوون.

دەستەیەك وەلید بەدوور لەو کارانە دەزانن کەئاماژەمان پێدا و بەناڕاستی لەقەڵەم دەدەن. وتوویانە: ئەم بووختانانە بۆ ئەو هەڵبەستراوە. وتاری ئەمانە راست نییە ((ئەوەی ئاماژەمان پێدا ڕاستە)) مەداینی دەڵێت: یەکێك لەکوڕەکانی عومەر کوڕی یەزید (برای وەلید) رۆشتە لای هارونی رەشید. ڕەشید وتی: لەکام هۆزیت؟ وتی: لەقوڕەیش. وتی لەکام

بنەماڵە؟ کوڕەکە بێدەنگ بوو. ڕەشید وتی: قسە بکە چوونکە ئەمانت هەیە ئەگەر تەنانەت مەروان بیت. وتی: عومەر کوڕی یەزیدم. وتی: خواوەند یەزیدی مامت و وەلید، نفرین بکات. خەلیفەیەکی کوشت کەخەڵك بۆ فەرمان بردنی فەرمانەکانی هاودەنگ بوون. چ نیازێکت هەیە. نیازەکانی خۆی باس کرد و هاڕون، نیازەکانی بەراوەردە کرد.

شەبیب کوڕی شیبە دەڵێت: لای مەهدی (خەلیفەی عەباسی) دانیشتبووم کەباسی وەلید هاتە ئاراوە. مەهدی وتی: پیاوێکی بێ دین بوو. باوکی عولاسەی فەقیە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند گەورە و گەورەتر لەوەیە کەجێگری پێغەمبەر(د.خ) و کاروباری خەڵکان بەپیاوێکی بێ دین بسپێرێت. کەسانێك بۆیان گێڕاوەمەتەوە کەلەناو بەزمەکانی ئەودا بەشدار بوون. ئەوان باسی توندی و سەختگیری ئەویان لەداوێن پاکی و نوێژەکانی دەکرد. کاتی نوێژ ، جلەکانی دادەکەند و بەباشترین شێوە، دەستنوێژی دەگرت و جل و بەرگی سپی و خاوێنی دەپۆشی و نوێژی دەخوێند. کاتێك لەنوێژ تەواو دەبوو، جلەکانی پێشووی لەبەر دەکردەوە و سەرقاڵی گەمە و چێژ وەرگرتن دەبوویەوە. ئەمەیە کرداری کەسێك کەباوەڕی بەخوا نییە! مەهدی وتی: بەختەوەر بیت، ئەی باوکی عولاسە.

(( قسەیەکی بێ هۆ و بێ مانایە، تەنیا درێژ دادڕییە.))

## بەیعەت لەگەڵ یەزید کوڕی وەلید (نوقسان)

لەم ساڵەدا بەیعەت بۆ یەزید کوڕی وەلید (نوقسان) وەرگیرا. لەبەر ئەوە بەنوقسان بانگی دەکەن چوونکە زیادەی بەخشینەکانی خەڵکی کەم کردەوە. وەلید دە درەمی بۆ هەر کەسێك زیاد کردبوو. یەزید ئەو دە درەمی کەم کردەوە هاوشێوەی ڕۆژگاری هوشام. دەڵێن: یەکەم کەس ئەوی بەنوقسان ناو برد، مەروان کوڕی محەممەد بوو.

کاتێك وەلید کوژرا، یەزید وتارێکی خوێندەوە و سەرکۆنەی کرد و ئاماژەی بەبێ دینی و کارە ناڕەواکانیدا. وتی: لەبەر ئەوە کوشتم چوونکە کردە و کردەوەکانی قێزەون بوو. یەزید وتی: ئەی خەڵکینە، ئێوە ئەو مافەتان لەملی مندایە، کەهیچ بەردێك نەخەمە سەر بەرد، خشتێك نەخەمە سەر خشتێك، ڕووبارێك هەڵنەکەنم، کەڵك لەناو وەرنەگرم، جۆگەیەك جیا نەکەمەوە، زێرابێکی تێ نەکەم، سامانەکان زیاد نەکەم، بەمناڵ یا ژنی نەبەخشم، زێر و زیوی شارێك نەبەم بۆ شارێکی دیکە تا سنورەکانی بەهێز و خەڵکەکەی لەهەژاری ڕزگار بکەم و ئەوسا زیادەکەی، بۆ شاری دراوسێ ببەم، ئێوە لەسنورەکانتان گیرۆدە نەکەم و هەڵتان

نەفریوێنم، دەرگا بەرووی ئێوەدا نەبەستم، ئەمانی ئێوە دژوار نەکەم، بەخششی ساڵانەتان پێ ببەخشم، مانگانە رۆژییەکانتان بەدوورترین کەسان بگەیەنێم تا ببنە هاوشێوەی نزیکترین کەسان. ئەگەر ئەوەی ئاماژەم پێدا، لەئەستۆ بگرم، لەسەر ئێوەیە، گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی من بن هاوشێوەی راوێژکارە راست کردارەکان. ئەگەر ئەرکەکانم ئەنجام نەدەن، دەتوانن لەسەر کار دوورم بخەنەوە مەگەر ئەوەی پەشیمان و تۆبە بکەم. ئەگەر بینیتان کەسێك بەچاکەکاری و بەخشندەیی ناوبانگی دەرکردەوە و ئەوەی من لەئەستۆی دەگرم، لەئەستۆی دەگرێت، دەتوانن، بەیعەتی لەگەڵ ببەستن و بزانن، من پێش هەموان دەستی بەیعەتی بۆ درێژ دەکەم. ئەی خەڵکینە، گوێرایەڵی ئافرێنراوەکان، شیاونییە ئەگەر گوناحکاری لەبەرابەر پەروەردگاری لەگەڵدا بێت.

## پەرێشان بوونی کاروباری ئومەوییەکان

لەم ساڵەدا، ئاژاوە لەناو ئومەوییەکان دەستیپێکرد و شۆڕشەکان یەك لەدوای یەك، سەریانهەڵدا. لەناو ئەوان، بزوتنەوەی سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، دوای کوژرانی وەلید، لەشاری عەممان، چوونکە وەلید لەو شارەدا زیندانی کردبوو. ئەو، لەزیندان هاتەدەر و سامانی شارەکەی هەڵگرت و رووی کردە دیمەشق. دەستی بەنفرین کردنی وەلید کرد و بەردەوام دەیوت کەئەو لەدین هەڵگەڕاوەتەوە.

## شۆڕشی خەڵکانی حمس

کاتێك وەلید کوژرا، خەڵکی حمس، دەروازەکانیان بەست وئاییینی پرسەیان بۆ گێڕا و ژنان شین و رۆڕۆیان کرد. پێیان وترا: عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك، لەکوشتنی ئەودا هاوکار بووە. ماڵەکەیان وێران و سامانەکەیان تاڵان کرد و شوێنی کەوتن بەڵام پەنای بۆ براکەی خۆی، یەزید برد. ئەوان دەستیان بەنامە نووسین بۆ سوپاییەکان کرد و نافەرمانیان کردەپیشەو پێشنیاری تۆڵەسەندنەوەی وەلیدیان، پێدەکردن. سوپاییەکان وەڵامیان دانەوە و بۆ نافەرمانی کردنی وەلید، هاودەنگ و هاوپەیمان بوون. معاویە کوڕی یەزید کوڕی حوسەین کوڕی نەمریان ((یەکێك لەبکوژەکانی حسین کوڕی عەلی لەنەینوا)) وەك فەرماندە و فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد و مەروان کوڕی عەبدواللە کوڕی عەبدولمەلیك، بوو بەهاودەستیان.

یەزید، کەسەکانی خۆی بۆ لای ئەوان نارد و ئامۆژگاری کردن. نەیانبیست و نێردراوەکانیان بریندار کرد. ئەو، براکەی مەسرور کوڕی وەلیدی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد و لەحوارین دابەزین. سلێمان کوڕی هوشام، ڕۆشتە لای یەزید. یەزید هەموو سامانەکانی بۆ گەڕاندەوە کەوەلید دەستی بەسەردا گرتبوو و ئەوی بۆ لای مەسروری برای و سوپاکەی ڕەوانە کرد و فەرمانی فەرمانبەری و گوێڕایەڵی پێکردن.

خەڵکانی حمس دەیانویست بەرەو دیمەشق بەڕێبکەون بەڵام مەروان کوڕی عەبدولمەلیك، پێی وتن: بۆچوونم وایە هێرش بکەنە سەر ئەو سوپایە و شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، لەناو بردنی ئەوان بۆ ئێوە ئاسانتر دەبێت. پەسەندی ناکەم بەرەو دیمەشق بەڕێکەون و ئەوان لەپشت سەری خۆتانەوە بەجێبێڵن. سەمت کوڕی سابت وتی: ئەو دەیەوێت بڵاوەی لێبکەن چوونکە لایەنگیری لەیەزید دەکات. ئەو و کوڕەکەیان کوشت و باوکی محەممەدی سوفیانیان هێنایە سەرکار. سوپاکەی سلێمانیان لەلای چەپ، بەجێهێشت و ڕێگەی دیمەشقیان گرتەبەر.

سلێمان تێکۆشەرانە هاتەدەر و لە سلێمانییە (گوندێکی تایبەت بەسلێمان کوڕی عەبدولمەلیك لەپشت عوزرا) ئەوانی بینی. یەزید کوڕی وەلید، عەبدولعەزیز کوڕی حەجاجی لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر، بەرەو تەپۆڵکەی عوقاب (هەڵۆ) ڕەوانە کرد و هوشام کوڕی موسادی لەگەڵ هەزار و پێنسەد کەس بۆ تەپۆڵکەی سەلامییە نارد. فەرمانی هاوکاری کردنی یەکتری پێدان. سلێمان و هاوڕێکانی بەدژواری و شەکەتەییەوە خۆیان بەوان گەیاند. شەڕێکی دژواریان دەستپێکرد. باڵی چەپ و ڕاستی سوپاکەی سلێمان شکستیان خوارد بەڵام خۆی لەدڵی سوپاکەدا مایەوە. هاوەڵانی هێرشیان کردە سەر خەڵکانی حمس و بۆ پاشەکشێ ناچاریان کردن. چەندین جار هێرشیان کردەسەر یەك.

لەشەڕ کردن بەردەوام بوون کە لەناکاو عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج لەپشت تەپۆڵکەکەوە گەیشت و هێرشی کردە سەر خەڵکانی حمس. هێرشی کردە سەر لەشکرگەکەی ئەوان و هەموو ئەو کەسانەی کوشت کەرووبەڕوویان بوویەوە. خەڵکانی حمس شکستیان خوارد و یەزید کوڕی خالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسری، هاواری کرد:خواوەندا، خواوەندا، فریای خەڵکەکەت بکەوە! خەڵك دەستیان هەڵگرت و سلێمان کوڕی هوشام پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ یەزید کوڕی وەلیدی پێکردن. باوکی محەممەدی سوفیانی و یەزید کوڕی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە، دیل کران. ئەم دووانەیان بردە لای سلێمان و ئەویش بۆ لای یەزید

ڕەوانەی کردن کەئەوانی زیندانی کرد. خەڵکانی دیمەشق بۆ فەرمانبەری کردنی یەزید کوڕی وەلید، هاودەنگ بوون. خەڵکانی حمسیش دەستی هاوکاریان بۆ درێژ کرد و یەزید بەخششەکانی لەناو ئەواندا بلاّو کردەوە. بەشێوەیەکی تایبەت ڕێزی لەگەورەکانی ئەوان گرت و معاویە کوڕی یەزید کوڕی حوسەینی وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان کرد.

## شۆڕشی خەڵکانی فەلەستین

لەم ساڵەدا خەڵکانی فەلەستین لەبەرابەر فەرماندارەکەیان سەعید کوڕی عەبدولمەلیك ئالاّی شۆڕشیان هەڵکرد و ئەویان دەرپەڕاند. وەلید ئەوی دەستنیشان کردبوو. یەزید کوڕی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیکیان بانگ کرد و وەك فەرماندەی خۆیان هەڵیانبژارد و پێیان وت: سەروەری باوەڕداران کوژراوە، ڕێبەرایەتی ئێمە بگرە دەست. ئەو جڵەوی کاروبارەکانی ئەوانی گرتەدەست و خەڵکی بۆ شەڕ دژی یەزید، هاندا. خەڵکان ڕازی بوون.

منداڵەکانی سلێمان لەفەلەستین دەژیان. خەڵکی ئەردەن ئاگادار بوونەوە کەفەلەستینییەکان شۆڕشیان دەست پێکردووە. ئەوان محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکیان وەك فەرمانداری خۆیان دەستنیشان کرد و بۆ شەڕ دژی یەزید کوڕی وەلید، هاوپەیمان بوون. جڵەوی کاروباری فەلەستینییەکان، لەدەستی سەعید کوڕی ڕوەح و زێبعان کوڕی ڕوەح بوو.

هەواڵی شۆڕشەکەی ئەوان بەیەزید کوڕی وەلید گەیشت. سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیکی لەگەڵ خەڵکانی دیمەشق و ئەو حمسیانەی لەگەڵ سوفیاندا بوون، بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد. ژمارەیان گەیشتە هەشتا و چوار هەزار شەڕکەر. یەزید کوڕی وەلید کەسی بۆ لای سەعید و زێبعان (منداڵەکانی ڕوەح) نارد و مژدە و بەڵێنی فەرمانڕەوایەتی و سامانی پێ پێشنیار کردن. ئەم دووانە لەگەڵ خەڵکانی فەلەستین بەڕێکەوتن و خەڵکانی ئەردەن مانەوە. سلێمان پێنج هەزار شەڕکەر ڕەوانە کرد کەدێهاتەکانیان تالاّن و ڕۆشتنە ناو تەبەرییە. خەڵکی تەبەرییە وتیان: ئێستا کەسوپاکە، لەناو ماڵەکانی ئێمەدا دەسووڕێنەوە و ئەوەی پێیان خۆش بێت، ئەنجامی دەدەن، بێدەنگ نابین. دەستیان بۆ تالاّن کردنی سوپاکەی یەزید کوڕی سلێمان و محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك درێژ کرد و چوارپێ و کەرەستەکانی شەڕی ئەوانیان گرت وگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان. کاتێك خەڵکانی فەلەستین و ئەردەن [illegible] لێکرد، سلێمان بەڕێکەوت تا گەیشتە سەنبەرە. خەڵکی ئەردەن لەدەوری [illegible] و لەگەڵ یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، بەیعەتیان بەست. ئەو ڕۆشتە تەبەرییە و

نوێژی هەینی لەگەڵ خەڵکەکەی خوێند و بەیعەتی لەگەڵ دانیشتووان بەست. (لەبەرژەوەندی یەزید کوڕی وەلید) بەرەو رەملە بەرێکەوت و بەیعەتی لەخەڵکەکەی وەرگرت و زێبعان کوڕی رەوحی وەك فەرمانداری فەلەستین و ئیبراهیم کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیکی وەك فەرمانڕەوای ئەردەن دەستنیشان کرد.

## لەسەر کار لابردنی یوسف کوڕی عومەر لەفەرمانڕەوایەتی عێراق

کاتێك وەلید کوژرا، یەزید، مەنسور کوڕی جمهوری وەك فەرمانڕەوای عێراق دەستنیشان کرد. پێشتر عەبدولعەزیز کوڕی هارون کوڕی عەبدوالله کوڕی دەحیە کوڕی خەلیفەی بۆ ئەو پێگەیە دیاری کردبوو. عەبدولعەزیز وتی: ئەگەر سوپایەکەم پێبدەن، رازی دەبم. یەزید ئەوی پشتگوێ خست و مەنسوری هەڵبژارد. مەنسور باوەڕدار نەبوو بۆیە هاورێیەتی یەزیدی دەکرد چوونکە خوازیاری سەرکەوتنی غەیلانییەکان ((شوێنکەوتەکانی غەیلانی دیمەشقی) و لەکوژرانی خالید قەسری بەدەستی یوسف کوڕی عومەر، توڕە بوو. لەبەر ئەوە، هاوکاری کوشتنی وەلیدی کرد و کاتێك یەزید، ئەوی وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان کرد، پێی وت: لەخوا بترسە و بزانە من بۆیە وەلیدم کوشت چوونکە کارە نەشیاوەکانی ئەنجامدەدا، کەواتە خۆت لەو کارانە بەدوور بگرە کەبوونە هۆکاری کوژرانی وەلید.

کاتێك هەواڵی کوژرانی وەلید بەیوسف کوڕی عومەر گەیشت، رووی کردە یەمانییەکانی نیشتەجێی سەرزەمینەکەی خۆی و ئەوانی زیندانی کرد. دواتر لەگەڵ یەك یەکی موزەرییەکان دانیشت وبەوانی دەوت: ئەگەر ئەم پەیوەندییە بپچڕێت، چی دەکەیت؟ موزەرییەکان دەیانوت: ئێمە خەڵکانی شامین، لەگەڵ هەرکەس بەیعەت بکەن، بەیعەت دەبەستم و ئەوەی ئەنجامی بدەن، شوێنی دەکەوم. لای یەمانییەکان هیچی دەستنەکەوت، دڵی پێ خۆش بکات. لەبەر ئەمە ئەوانی ئازاد کرد.

مەنسور بەرەو عێراق بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە عەین ئەلتەمر، بۆ فەرماندەکانی خەڵکی شام لەحیرە نامەی نووسی و کوژرانی ودلید و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی خۆی، بەوان راگەیاند و فەرمانی پێدان، گەمارۆ بخەنە سەر یوسف و کارگوزارەکانی. نامەکانی بۆ سلێمان کوڕی سولەیم کوڕی کەسان رەوانە کرد تا لەناو فەرماندەکان بلاّوی بکاتەوە. ئەو نامەکانی دابەش کرد و نامەکەی خۆی بۆ یوسف کوڕی عومەر خوێندەوە.. یوسف سەرگەردان و بەسلێمانی وت: بۆچونی پەسەند چییە؟ وتی: رێبەرێکت نییە تا لەژێر ئاڵای ئەودا شەڕ

بکەیت، خەڵکانی شام بۆ هاوکاری تۆ شەڕ ناکەن و من لەمەنسور بۆ گیانی تۆ دەترسم. باشترین کار ئەوەیە بۆ شام بڕۆیت. وتی: چۆن؟ وتی: فەرمانبەری خۆت بۆ یەزید ئاشکرا دەکەیت و لەوتارەکانت خەڵك بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵ ئەو، هان دەدەیت. کاتێك مەنسور نزیك کەوتەوە، لای من خۆت بشارەوە و کاروباری فەرمانڕەوایەتی بەو دەسپێریت. سلێمان ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی محەممەد کوڕی سەعید کوڕی عاس و لەکارەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە و داوای لێکرد تا پەنای یوسف بدات. عەمرۆ ڕازی بوو. یوسف کوڕی عومەر ڕۆشتە لای ئەو. وتی: هەرگیز نەبینراوە پیاوێکی بەو ئەندازەیە دڵڕەق وبێ بەزەیی و ڕەشبین و یاخی، بەو شێوەیە ریسوا و ترساو بووبێت.

مەنسور ڕۆشتە کوفە و وتارێکی پێشکەش بەخەڵك کرد. وەلید و یوسفی سەرکۆنە و شاعیرەکان لەگەڵ ئەم، ئەوانیان سەرکۆنە کرد. عەمرۆ کوڕی محەممەد ڕۆشتە لای یوسف و لەچۆنیەتی کارەکان ئاگاداری کردەوە. ناوی هەر کەسێکی بەناخۆشی هێنایە سەرزمان، یوسف وتی: پەیمان و بەڵێنی خوایی لەئەستۆمدا بێت، ئەوەندە قامچی لێبدەم. عەمرۆ کوڕی محەممەد سەریسوڕما لەوەی هێشتا چاوی تەماحی لەفەرمانڕەوایەتی هەیە و بەمشێوەیە هەڕەشە لەخەڵکان دەکات.

یوسف بەنهێنی لەکوفەوە بۆ شام بەرێکەوت و لەبەلقا دابەزی. کاتێك یەزید لەمە ئاگادار بوویەوە، پەنجا سواری بۆ شوێنکەوتنی ئەو ڕەوانە کرد. پیاوێك لەبەنی نومەیر چاوی بەیوسف کەوت و پێی وت: ئەی کوڕی عومەر، سوێند بەخوا، دەکوژرێیت. گوێ لەمن بگرە و پەنا بۆ شوێنێك ببە. وتی: نایکەم. وتی: ڕێگە بدە بتکوژم تا خەڵکانی یەمەن نەتکوژن و بەمشێوەیە ئازاری ئێمە نەدەن. وتی: لەرازی بوون بەم پێشنیارە دەترسم. وتی: خۆت دەزانی.

نێردراوان بۆ دەستگیر کردنی ئەو بەرێکەوتن. بەدوایدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە. کوڕەکەیان گرت و هەڕەشەیان لێکرد. وتی: بۆ گوندەکەی خۆی ڕۆشتوە. بەدوای ئەودا بەرێکەوتن. کاتێك هەستی بەهاتنی ئەوان کرد، هەڵات و پێڵاوەکانی فرێدا. بەدوایدا گەڕان و لەناو دەستەیەك ژن ئەویان بینی کەچارشێوێکی دابوو بەسەر خۆیدا. چارشێوەکە لەخەز و کەنارەکانیان بەگوڵ چنیبوو. قاچیان راکێشا و ئەویان گرت و بۆ لای یەزیدیان برد. یەکێك لەپاسەوانەکان ریشی ئەوی گرت و هەڵیکەند. ئەو لەناو خەڵکان درێژترین ڕیش و وردترین ئەندامی بوو. کاتێك ئەویان بردە لای یەزید، ڕیشی خۆی بەدەستەوە گرت کەتا

ناوکی دەهات. بەردەوام دەیوت: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەخوا ئەو ڕیشی هەڵکەندم. یەزید فەرمانیدا لەخەزرا، زیندانی بکەن. پیاوێك هاتە لای وپێی وت: ناترسێت یەکێك لەدوژمنەکانت بەردێکت بۆ بهاوێت و بتکوژێت! وتی: هەستم بەمە نەکردبوو. کەسی بۆ لای یەزید نارد و داوای لێکرد تا لەشوێنێکی دیکە زیندانی بکەن ئەگەر لەخەزرایش ناخۆشتر و بچوکتر بێت. یەزید لەنەزانی ئەو، سەریسوڕما. ئەوی لەوێ برد و لەگەڵ دوو کوڕەکەی وەلید، زیندانی کرد. لەهەمموو رۆژگاری خەلافەتی یەزید و دوو مانگ و دە رۆژ لەفەرمانڕەوایەتی ئیبراهیم، لەزیندان مایەوە. کاتێك مەروان لەدیمەشق نزیك کەوتەوە، یەزید کوڕی خالیدی قەسری کوشتنی ئەوی بەیەکێك لەکۆیلەکانی باوکی بەناوی باوکی ئەسەد، سپارد.

مەنسور کوڕی جمهور چەند رۆژێك بۆ کۆتایی رەجەب، کۆتاییەکانی مارسی ٧٤٤ زایینی ڕۆشتە ناو شاری کوفە و دەستی بەسەر گەنجینەکاندا گرت و بەخشش و رۆژی خەڵکانی جیا کردەوە و کارگوزاران و وەرگرانی خەراجی لەزیندانْ ئازاد و لەبەرژەوەندی یەزید، بەیعەتی لەعێراقییەکان وەرگرت و کۆتاییەکانی رەجەب و مانگی شەعبان و رەمەزان/ ئاوریل و مەی و ژوئەنی ٧٤٤ زایینی لەو شارە مایەوە و چەند رۆژێك بۆ کۆتایی مانگی رەمەزان، ئەو شارەی بەجێهێشت.

## شۆڕشی نەسر کوڕی سەیار لەبەرابەر مەنسور

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی سەیار لەخوراسان لەبەرابەر مەنسور، ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد و رازی نەبوو ئەم پانتاییە بەو بسپێرێت. یەزید، ئەو سنورەی پەیوەستی فەرمانڕەوایەتی مەنسور کردبوو. پێشتر ئاماژەمان پێدا کەیوسف کوڕی عومەر نامەی بۆ نەسر نووسی تا بۆ لای ئەو بەرێکەوێت. نەسر خۆی دوادەخست، بەڵام بەرێکەوت و دیاری و خەڵاتەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت. هەواڵی کوژرانی وەلیدی پێگەیشت و گەڕایەوە و خەڵات و دیارییەکانی لەگەڵ خۆی گەڕاندەوە. کۆیلەکانی ئازاد کرد و کەنیزە جوان روخسارەکانی لەناو منداڵ و کەسەکانی خۆی دابەش کرد. دەفرەکانی بەکارگوزرانی خۆی سپارد و ئەوانی بۆ سووچ و کەنارەکان ڕەوانە و فەرمانی پێدان بەشێوەیەکی پەسەند کراو هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکان بکەن. مەنسور، براکەی خۆی، مەنزوری کردە فەرمانڕەوای رەی و خوراسان بەڵام نەسر بەفەرمانەکانی رازی نەبوو و لەبەرابەر ئەو، پارێزگاری لەسەرزەمین و سنوری فەرمانڕەوایەتیەکەی کرد.

## شەڕی خەڵکانی یەمامە لەگەڵ فەرماندارەکەیان

کاتێك وەلید کوڕی یەزید کوژرا، عەلی کوڕی موهاجیر فەرمانداری یەمامە بوو. یوسف کوڕی عومەر ئەوی دەستنیشان کرد. موهەیر کوڕی سولەمی کوڕی هیلال پێی وت: سەرزەمینەکەمان بەجێبێڵە و برۆ. رازی نەبوو. موهەیر سوپایەکی لەبەرابەر ئەو رازاندەوە و هێرشی کردەسەر کە لەکۆشکەکەی لەدەشتی هیجر ژیانی بەسەر دەبرد. ئەوان، لەدەشتەکە خۆڕاگریان کرد و شەڕێکی دژوار روویدا. عەلی کوڕی موهاجیر شکستی خوارد و بۆ ناو کۆشکەکەی گەڕایەوە. یەحیا کوڕی ئەبی حەفص رێگەی شەڕ کردنی لەعەلی کوڕی موهاجیر گرتبوو. بەڵام عەلی گرنگی بەوتەکانی نەدا. یەحیا وتی:

بذلت نصيحتى لبنى كلاب     فلم تقبل مشاوريى و نصحى

فدا لبنى حنيفة من سواهم     فانهم فوارس كل فتح

یانی: پەند و ئامۆژگاری خۆم بەبەنی کەلاب بەخشی بەڵام بەچاکەخوازی و راوێژی من، رازی نەبوون. قوربانی منداڵەکانی حەنیفە بن هەرکەس جیا لەوانن چوونکە ئەوان هۆکاری هەموو سەرکەوتنەکانن.

شەقیق کوڕی عەمرۆ سەدووسی وتی:

اذا انت سالمت المهير و رهطه     امنت من الاعداء و الخوف و الذعر

غتى راح يوم الروع روحة ماجد     اراد بها حسن السماع مع الاجر

یانی: کاتێك لەگەڵ موهەیر و هاوەڵانی رێگەی ئاشتی دەگریتەبەر، لەدوژمن و ترس و تۆقان بەدووریت. ئەو گەنجەی لەشەڕی دەشت، بەباشترین شێوە، شەڕی دەکرد و بەدوای گوێچکەیەکی گوێڕایەڵ و پاداشتی خوایی دگەڕا.

ئەم شەڕەیان بەشەڕی دەشت ناو بردووە.

موهەیر بەشێوەیەکی خۆپەرستانە فەرمانڕەوایی خەڵکانی یەمامەی گرتەدەست و دواتر عەبدوالله کوڕی نوعمان (یەکێك لەپیاوانی قەیس کوڕی سەعلەبە کوڕی دوئەلی) وەك جێگری خۆی لەیەمامە دەستنیشان و ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

عەبدوالله کوڕی نوعمان، موندەلیس کوڕی ئیدریسی حەنەفی وەك فەرمانداری فەلەج (گوندێك لەگوندەکانی بەنی عامر کوڕی سەعسەعە یا بەنی تەمیم) دەستنیشان کرد. بەنی کەعب کوڕی رەبیعە کوڕی عامر، هاوڕێ لەگەڵ بەنی عەقیل و باوکی فەلەج موندەلیس،

لەبەرابەرئەو، سوپایەکی ئامادە کرد و بەمەبەستی شەڕ، ڕووبەڕووی ئەوان بوویەوە. موندەلیس و زۆربەی هاوەڵانی کوژران و لەهاوەڵانی (بەنی عامر) کەسانێکی زۆر نەکوژران. لەم ڕۆژەدا یەزید، کوڕی تەسرییە، کوژرا. تەسرییە، دایکی ئەو بوو کەرەچەڵەکی بۆ تەسر کوڕی عەمرۆ کوڕی وایل، هەمان یەزید کوڕی مونەتەشیر، دەگەڕێتەوە. براکەی سور کوڕی تەسریە، لەپرسەی ئەودا وتی:

ارة الاثل من نحو العتيق مجاوری          مقيما و قد غالت يزيد غوائله

و قد كان يحمى المحجرين بسيفه          و يبلغ اقصى حجرة الحى نائله

یانی: دەبینم داری سوێری گەزۆ، لەعەتیق، لەدراوسێیەتی من، لق و پۆپی دەرکردووە و لەناو بەرانی یەزید، گەمارۆیان خستە سەر. پیاوێکی بەهێز کە بەشمشێری ئاودار تا دوورترین شوێنی خەڵکانی ئێمە، بۆ پێشەوە غاریدەدا و لەرێگەی هەژاران، گیانی دەبەخشی.

ئەمە یەکەمین شەڕی فەلەج بوو.

کاتێك هەواڵی کوژرانی موندەلیس بەعەبدوالله کوڕی نوعمان گەیشت، هەزار پیاوی شەڕکەری لەحەنەفییەکان و کەسانیتر کۆکردەوە و بۆ شەڕی فەلەج بەرێکەوت. کاتێك هەردوو لای شەڕکەر ریزیان بەست، باوکی لەتیفە کوڕی موسلیمی عەقیلی شکستی خوارد و شاعیر وتی:

فر ابوو لطيفة المنافق          و الجفو نيان و فر طارق

لما احاط بهم البووارق

یانی: باوکی لەتیفەی ریاکار، هەڵات و جەعفونییەکان و تارق هەڵاتن. ئەمە ئەو کاتە بوو شمشێرە درەوشاوەکان گەمارۆیان خستە سەریان.

مەبەستی تارق کوڕی عەبدوالله‌ی قوشەیری بوو و جەعفونییەکان لەمناڵەکانی قوشەیرین.

مناڵەکانی جوعدە زرێکانیان فرێدا و هەڵاتن. زۆربەیان کوژران و دەستی زیاد کوڕی حەییانی جوعدی قرتا و لەجەستەی جیابوویەوە. وتی:

انشد كفا ذهبت و ساعدا          انشدها و لا ارانی واجدا

یانی: بەدوای دەست و بازووی لەدەست چووم، دەگەڕێم، بەدوایدا دەگەڕێم و خۆم بەخەمبار نابینم. دواتر کوژرای و یەکێك لەخەڵکانی رەبیع وتی:

سمونا لكعب بالصفائح و القنا          وبالخيل شعثا تنحنى يالشكائم

فما غاب قرن الشمس حتى رايتنا          نسوق بنى كلب كسوق البهائم

بضرب يزيل الهام عن سكناته          و طعن كا فواه المزاد الثواجم

یانی: بەشمشێری ئاودار و ڕمە گیانستێنەکان هێرشمان کردە سەر خەڵکانی کەعب. سوار ئەسپە تیژپێکان بووین کە لەتاو غاردانی زۆر، مووی سەر جەستەیان ڕاست ببوویەوە و لەتاو تورەیی، هەوسارەکانیان دەجوو. هێشتا تاجی هەتاو ئاوا نەببوو کەدەتبینی، ئێمە منالەکانی کەعب، هاوشێوەی چوارپێکان بۆ پێشەوە دەبەین. بەو لێدانانەی سەری شێرەپیاوەکان لەجەستەیان جیا دەکاتەوە و بەوەشاندنی ئەو ڕمانەی، دەمی هاوشێوەی دەمی وشترە مەستەکانی لێدەکەوتەوە.

ئەمە دووەمین شەڕی فەلەج بوو.

منالەکانی عەقیل، قوشەیر، جەعدە، نومەیر و کەسانی دیکە بەسەرکردایەتی باوکی سەهلەی نومەیری کۆبوونەوە و کەسانێکیان لەمنالەکانی حەنیفە گرت و لە (کان صخراء) ئەوانیان کوشتار و دەستی تالان و برەویان لەناو ژنەکانیان، ئاوەلا کرد. بەنی نومەیر پارێزگاریان لەژنەکان کرد. کاتێك عەمرۆ کوڕی وازعی حەنەفی بینی عەبدوالله کوڕی نوعمان لەشەڕی دووەمی فەلەج، دەست بۆ ئەنجامدانی چ کارێك درێژ دەکات، وتی: لەعەبدوالله کەمتر نیم و لەکەسانی هاوشێوەی ئەو، دواکەوتوتر نیم کەبەردەوام هێرش دەکەنە سەر ئەم لاولا. ئەمە، ڕۆژگارێکە، ترس، لەسزای پاشا، بوونی نییە. سوارەکانی خۆی کۆکردەوە و هاتە شەریف و شەڕکەرانی بەم لاولادا ڕەوانە و خۆی دەستی بەتالان کردن کرد. تالانییەکی زۆری کۆکردەوە. خۆی و هاودلانی بەرێکەوتن تا گەیشتنە نەشاش. بەنی عامر کۆبوونەوە و عومەر کوڕی وازع نەکەوتە خۆی کەهاواری پیاوان و دەنگی وشترەکانی بیست. ژنەکانی لەخێوەتێکدا کۆکردەوە و چەند کەسێکی بۆ پاسەوانی کردنی ئەوان ڕاسپارد. شەڕی لەگەڵ خەڵکان کرد. خۆی و هاورێکانی شکستیان خوارد و هەلاتن. عومەر کوڕی وازع هەلات و پەیوەستی یەمامە بوو. ژمارەیەکی زۆر لەمنالەکانی حەنیفە، وەك گەلای دارەکان کەوتنە سەرزەوی. ئەوان لەناو دلی سوپاکەدا بوون و لەتینویەتی و برسیەتیدا بەم چارەنووسەت گرفتار بوون. بەنی عامر لەگەڵ ئەسیر و ژنەکان گەڕانەوە و قەحیف وتی:

و بالنشاش يوم طار فيه          لنا ذكر و عد لنا فعال

یانی: شەڕی نەشاش بەشێوەیەك بوو کەناوی ئێوە وەك باڵندەکان لەزەمینی هەموو

کەساندا مایەوە و کارە گەورەکانی ئێمە بەگوێی هەموان گەیشت.

هەروەها وتی:

فداء خالتي لبني عتيل و كعب حين تز دهم الجدود

هم تركوا على النشاش صرعى بضرب ثم اهونه شديد

یانی: پوورم قوربانی منالەکانی تەمیم بێت و دەستەیەك لەکەعب، ئەو کاتەی روخساری فراوانی گەورەکان کۆدەبنەوە. ئەوان لەنەشاش لەناو خاك و خوێندا گەوزان و ئەمە بەدوای ئەو لێدانە بوو، کەنەرمترین و سووکترینی، بەدژوارترینی هەژمار دەکرا.

خەڵکانی قەیس لەشەڕی نەشاش، تالأن و برەویان نەکرد بەلأم (لەوێوە کە تالأن کردن لەناو خوێنی ئەم خەڵکەدایە) خەڵکانی عوکلی، دەستیان بۆ تالأن کردن درێژ کرد و کوژراوەکانیان تالأن کرد. ئەمە، تەنیا شەڕی نەشاش بوو. دوای ئەوە بەنی حەنیفە نەیانتوانی کۆببنەوە و لەسەر کارێك هاودەنگ بن. جگە لەوەی عوبەیداللە کوڕی موسلیمی حەنەفی دەستەیەکی کۆکردەوە و لەسەر ئاوێکی تایبەت بەقورەیشیەکان (کەپێیان دەوت حولبان) هێرشی کرد و شاعیر وتی:

لقد لاقت قشير يوم لاقت عبيداللة احدى المنكرات

لقد لاقت على حلبان ليثا هزبر لا ينام على التراب

یانی: قوشەیرییەکان لەکاتی شەڕ، عوبەیداللەیان وەك شەڕکەرێکی بەهێز بینی کەیەکێك لەسەرسوڕهێنەرەکانی جیهانە. ئەوان لەحولبان، شێری ژیانیان بینی کە لەسەر خاك پاڵ ناکەوێت.

ئەو هێرشی کردە سەر خەڵکانی عوکەل و بیست هەزار کەسی لەوان کوشتار کرد.

موسەنا کوڕی یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرەی فەزاری وەك فەرماندار، بەنوێنەرایەتی لەلایەن باوکی، یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە (کارگوزاری خەلیفەی ئومەوی (مەروانی کەر) لەعێراق) هاتە یەمامە. کاتێك وەك فەرماندار ڕۆشتە لای ئەوان کەخەڵکان ڕێگەی ئاشتیان گرتبووە بەر. لەبەر ئەمە شەڕ، روویندا. بەنی عامر لەزیانی بەنی حەنیفە شایەتیاندا و موسەنا (کەخۆی لەخەڵکانی قەیس بوو) کاروبارەکانی لەوان دژوار کرد و دەستەیەك لەبەنی حەنیفەی قامچی باران و سەر و ریشی ئەوانی تاشی. یەکێك لەوان وتی:

فان تضربوونا بالسياط فانما ضربنا كم بالمرهات الصوارم

و ان تحلقوا منا الرؤوس فاننا           قطعنا رؤوسا منكم بالغلاصم

یانی: ئەگەر ئەمڕۆ، ئێمەتان قامچی باران کرد، ئێمە دوێنێ بەشمشێرە تیژەکان ئێوەمان لەت وپەت کرد. ئەگەر ئێوە سەری ئێمەتان تاشی، ئێمە سەری ئێوەمان لەقوڕگتانەوە بڕی و بەدبەختمان کردن.

دواتر ئەو شارانە ئارام و هێور بوونەوە و عوبەیدالله کوڕی موسلیمی حەنەفی بەشێوەیەکی شاراوە لەخەڵکان ژیانی بەسەر دەبرد تا ئەو کاتەی سەری کوڕی عەبدواللەی هاشمی وەك فەرمانداری عەباسییەکان هاتە یەمامە. شوێنی خۆشاردنەوەی ئەویان نیشاندا. ئەوی گرت و کوشتی. نووح کوڕی جەریری خەتەفی وتی:

فلولا السری الهاشمی و سیفه           اعاد عبیدالله شرا علی عکل

یانی: ئەگەری سەری هاشمی نەبوو و شمشێرەکەی نەدەوەشێندرا، عوبەیدالله بەڵایەکی دیکەی بەسەر خەڵکانی عوکەلدا دەهێنا.

## لەسەرکارلابرانی مەنسور لەعێراق

### فەرمانڕەوایەتی عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز

لەم ساڵەدا یەزید، کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك، مەنسور کوڕی جمهوری لەسەر کار لابرد و دوای ئەو ، عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی کردە فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە. کاتێك ئەوی دەستنیشان کرد، پێی وت: بەرەو عێراق بەرێکەوە چوونکە خەڵکەکەی شوێنکەوتەی باوکی تۆن. بەرەو عێراق بەرێکەوت و پێش خۆی، چەند کەسێکی لەفەرماندەکانی خۆی وەك نێردراو، بۆ لای عێراقییەکان ڕەوانە کرد. ترسا مەنسور فەرمانڕەوایەتی تەسلیم نەکات. خەڵکانی شام فەرمانبەری خۆیان نیشاندا و مەنسور فەرمانڕەوایەتی بەو سپارد و بۆ شام گەڕایەوە. عەبدوالله، کارگوزارانی بۆ شارەکان ڕەوانە و رۆژی و بەخششەکانی خەڵکی، لەناو ئەواندا دابەش کرد. فەرماندەکانی شام دژایەتیان کرد و وتیان: دەسکەوتەکانی ئێمە لەناو ئەواندا دابەش دەکەیت کەدوژمنی ئێمەن؟ بەعێراقییەکانی وت: دەمەوێت دەسکەوتەکانی شەڕی خۆتان، بۆ خۆتان بگەڕێنمەوە چوونکە دەزانم، ئێوە بۆ ئەو دەسکەوتانە سزاوارترن بەڵام، فەرماندەکانی شام، دژایەتیم دەکەن. کوفییەکان لەجەبانە کۆبوونەوە (تا ئاژاوە بنێنەوە و خەڵکانی شام سەرکوت بکەن) خەڵکانی شام، کەسانێکیان بۆ لای ئەوان ڕەوانە و داوای لێخۆشبوونیان کرد. کۆمەڵانی خەڵك

لەهەر دوولا، دژایەتی یەکیان کرد و کەسانێك لەم ناوەدا کوژران کەکەس نەیزانی کێن. عەبدوڵلە کوڕی عومەر، عومەر کوڕی غەزبانی قوبەعسەری وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی خۆی دەستنیشان و کۆکردنەوەی خەراجی سوادی بەو سپارد.

لەم ساڵەدا لەخوراسان، لەنێوان یەمانییەکان و نەزارییەکان ناسازگاری کەوتەوە و کرمانی نافەرمانی فەرمانەکانی نەسر کوڕی سەیاری کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو نەسر بینی ئاژاوە سەریهەڵداوە. لەبەر ئەمە داهاتی گەنجینەی بژارد و لەدەفتەرەکاندا نووسی و بەشێك لەبەخششەکانی خەڵکی بەشێوەی سکە زیوینەکان و دەفرە زێڕینەکان،(کە بۆ وەلید کۆکرابوویەوە) بەوان بەخشی. خەڵك، لەکاتی وتار خوێندنەوەی ئەو، خوازیاری بەخششەکانی خۆیان بوون. نەسر وتی: گوناحکاری لەمن بەدوور بێت! و هاورێیەتی کۆمەڵانی خەڵك و فەرمان بردن لەرێبەر، ئەرکی سەرشانی ئێوە بێت. بازارییەکان هەستان و گەڕانەوە بۆ سەر کارەکانی خۆیان. نەسر تورە بوو و وتی: ئێوە لای من بەخششتان نییە. وتی: لەئێستاوە داهاتووی ئێوە بەشێوەیەك دەبینم کەزیانێکی تاقەت پڕوکێن لەژێر قاچەکانی ئێوەوە، سەر بەرز دەکاتەوە. دەتانبینم هاوشێوەی وشترە کوژراوەکان، لەبازارەکان، کەوتونەتە سەرزەوی. هەرکەس فەرمانڕەوایەتییەکەی درێژە بکێشێت، خەڵکان لێی بێزار دەبن. ئێوە ئەی خەڵکانی خوراسان، پێگەی بەرگری ئێمە لەبەرابەر دوژمنەکانن. کارێکتان دەست پێکردووە و دەرئەنجامەکەی ئاژاوەیەکی سەراسەرییە. خواوەند نەتانپارێزێت. دەستم بەسەر ئێوەدا گرت و شارەکانتانم بڕی و شارەکانتانم بڕی و دەستم بەسەر داگرت. تێگەیشتم تەنانەت دە کەس لەئێوە، هاورێ راستەقینەکانی من نین. من و ئێوە بەو شێوەین کەشاعیر دەڵێت:

استمسکوا اصحابنا نحدوبکم فقد عرفنا خیرکم و شرکم

یانی: هێز بەدۆستانی ئێمە ببەخشن تا دەست لەئێوە هەڵبگرین چوونکە بەشێوەیەکی باش، خێر و شەڕی ئێوەمان بینی و ئەزمونمان کرد.

لەخوا بترسن، سوێند بەخوا ئەگەر تەنیا دو شمشێر لەشمشێرەکانی ئێوە بۆ ناسازگاری کردنی یەکتر لەکاڵان دەربکێشرێن، هەرکام لەئێوە ئارەزوو دەکات، بۆ لای ژن و منداڵ و مەبەستەکانتان بگەڕێتەوە. ئەی خەڵکانی خوراسان، ئێوە یەکیەتیتان لەگەڵ خەڵکان کەم بەها و بڵاوەتان لێکرد. دواتر ئەم هۆنراوەی نابغەی زوبیانی هێنایە سەر زمان:

فان یغلب شقاؤکم علیکم فانی فی صلاحکم سعید

یانی: ئەگەر بەدبەختی بەسەر ئێوەدا زاڵ ببێت، بزانن من بۆ چاککردنەوە و باشتر کردنی کاروباری ئێوە، هەوڵمداوە.

لەلایەن عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، فەرمانێك بۆ نەسر بۆ فەرمانڕەوایەتی کردنی خوراسان نێردرا. کرمانی بەهاوەڵانی خۆی وت: خەڵك بەرەو ئاژاوەیەکی گشتی دەڕۆن، پیاوێك وەك ڕێبەری خۆتان دەستنیشان بکەن.

لەبەر ئەوە بەکرمانی ناویان دەبرد چوونکە لەکرمان چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ناوی جودەیع کوڕی عەلی ئەزدی مەعنی بوو. خەڵکان پێیان وت: تۆ ڕێبەری ئێمە بە.

موزەریەکان بەنەسریان وت: کرمانی کارەکانی تۆ بەفیڕۆ دەدات، کەسێك بەدوای ئەو ڕەوانە بکە و دواتر بیکوژە یا بیخە زیندانەوە. نەسر وتی: ئەو کارە ناکەم. بەڵام من کوڕ و کچم هەیە. کچەکانی ئەو دەکەمە هاوسەری کوڕەکانم و کچەکانم دەکەمە هاوسەری کوڕەکانی. وتیان: ئەمە ڕاست نییە. وتی: سەد هەزار درەمی بۆ دەنێرم چوونکە پیاوێکی سواڵکەرمئاسایە و دینارێك بەهاوەڵانی نادات و بەمشێوەیە لەدەوری ئەو بڵاوەی لێدەکەن. وتیان: ئەم بۆچونەیش ڕاست نییە چوونکە دەبێتە هۆی بەهێزی ئەو. پێداگریان کرد کەوتیان: ئەگەر کرمانی بزانێت دەتوانێت بەباوەڕهێنان بەئایینی جولەکە یا مەسیحی، ڕێبەرایەتی دەگرێتە دەست، باوەڕ بەو ئایینانە دێنێت.

نەسر و کرمانی هاودڵ و خوازیاری یەکتر بوون. کرمانی لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەسەد کوڕی عەبدوالله، چاکەی زۆری لەگەڵ نەسر کردبوو. کاتێك نەسر هاتە سەرکار، کرمانی لەسەر کار لابرد و سەروەری بەکەسێکی دیکە بەخشی. لەم کاتە بەدواوە، لەیەك دوور کەوتنەوە.

کاتێك سەبارەت بەکرمانی پێداگریان کرد، نەسر بڕیاری زیندانی کردنی ئەویدا. سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی ڕەوانە کرد تا بیهێنێت. ئەزدیان بڕیارپیاندا ڕزگاری بکەن. کرمانی ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن و لەگەڵ سەرکردەی پاسەوانەکان بۆ لای نەسر بەڕێکەوت و دەم بەپێکەنین، ڕووبەڕووی بوویەوە. کاتێك کرمانی ڕۆشتە ناون نەسر پێی وت: ئەی کرمانی، مەگەر نامەی یوسف کوڕی عومەر بەدەستم نەگەیشت کەفەرمانی کوشتنی تۆی دەدا؟ ڕۆشتمە لای و وتم: پیر و سوپاسالاری خوراسانییەکانە، مەگەر ڕێگەم لەرژانی خوێنی تۆ نەگرت؟ وتی: بەڵێ. وتی: مەگەر قەرزەکانی تۆم نەدایەوە و ئەوەی لەبەخشینەکان کەوتبووە ئەستۆی تۆ، لەئەستۆم نەگرت و قورسایی ئەو کارەم لەسەر شان هەڵنەگرتی؟ وتی:

بەڵێ. وتی: مەگەر کوڕەکەی تۆ، عەلیم، لەداخی خەڵکەکەت، نەکردە سەروەر؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئێستا تۆی هیچی ئەم کارانەت لەبیر نییە و خەڵکان بۆ ئاژاوە کۆدەکەیتەوە؟ کرمانی وتی: سەروەرم هەرچی هێنایە سەرزمان، راستە و زیاتر لەوەیش کەفەرمووی. بۆ ئەم کارانەی سپاسی دەکەم. لەرۆژگاری ئەسەد کاروبارەکان لەسەر دەستی منڈا دەسوڕا کەدەزانی و هەمووی لەبەرژەوەندی تۆدا بوو. دەبێت فەرماندار ئارام بگرێت و بزانێت کەمن ئاژاوەچی نیم. سالم کوڕی ئەحوەز وتی: ئەی فەرماندار، بیکوژە. عەسمە کوڕی عەبدوڵڵەی ئەسەدی بەکرمانی وت: تۆ دەتەوێت ئاژاوە بنێیتەوە بەڵام توانای ئەنجامدانی ئەو کارەت نییە. میقدام کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیمی عامری و براکەی قودامە کوڕی عەبدولرەحمان، پێکەوە وتیان: هاونشینەکانی فیرعەون باشتر لەئێوە بوون چوونکە وتیان: مۆڵەت بەخۆی و براکەی بدە (اعراف/١١١/٧). سوێند بەخوا کرمانی بەهۆی وتەکانی ئێوە، ناکوژرێت. نەسر فەرمانی ئەشکەنجە کردنی ئەوی دەرکرد و لەقەڵای کۆن، زیندانیان کرد. ئەم رووداوە، سێ رۆژ بۆ کۆتایی رەمەزانی ١٣٦/ ١٣ ژوئیەی ٧٤٤ زایینی روویدا.

ئەزدییەکان زمانیان بۆ سەرکۆنە کردن کردەوە و نەسر وتی: سوێندم خواردووە، زیندانی بکەم بەڵام زیانی پێنەگەیێنم. ئەگەر بۆ ئەو دەترسن، پیاوێك هەڵبژێرن تا هاورێیەتی بکات. ئەوان یەزیدی نەحویان هەڵبژارد. یەزید، هاورێیەتی کرمانی کرد و رۆژەکانی ژیانی زیندانی لەگەڵ ئەو بردەسەر.

پیاوێك لەخەڵکانی نەسەف هات و بەبنەماڵەی کرمانی وت: چی بەمن دەبەخشن ئەگەر چارەیەك بدۆزمەوە و ئەو لەزیندان بهێنمەدەر؟؟ وتیان: هەرچی بخوازیت. ئەو، رۆشتە سەر رێگەی ئاوەڕۆی قەڵای کۆن و بەکوڕەکانی کرمانی وت: نامەیەك بۆ باوکتان بنێرن تا ئەمشەو بۆ هاتنەدەر خۆی ئامادە بکات. نامەیان بۆ نووسی و لەناو خواردنەکاندا شاردیانەوە. کرمانی و یەزید و خزر کوڕی حەکیم نانی شەویان خوارد. ئەو دووانە کرمانیان بەجێهێشت. کرمانی رۆشتە ناو کارێزەکە و مارێك لەکەمەرییەوە ئاڵا بەڵام زیانی پێنەگەیاند. ئەو لەرێگەی ئاوەڕۆکەوە هاتەدەر و سواری ئەسپەکەی خۆی (بەشیر) بوو. بەند لەقاچیدا بوو. ئەویان بردە لای عەبدولەلیك کوڕی حەرملە و بەندەکانی بۆ کردەوە.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو جودەیع کوڕی عەلی (کرمانی)، بەدەستی یەکێك لەکۆیلەکانی لەزیندان رزگاری بوو. کۆیلەکە، کەلێنێکی گەورەی لەدیوارەکەدا بینی و گەورەی کرد و ئەوی لەزیندان هێنایەدەر. بەرەبەیان نەبوویەوە کەنزیکەی هەزار پیاوی

شەڕکەر لەدەوری کۆبوونەوە. خۆر ئاوا نەبوو کەژمارەیان گەیشتە سێ هەزار شەڕکەر. خەڵکانی ئەزد، لەگەڵ عەبدولمەلیک کوڕی حەرملە لەسەر بنەمای نووسراوی خواوەندو شێوازی پێغەمبەر، بەیعەتیان بەستبوو. کاتێك کرمانی بەرێکەوت، عەبدولمەلیك، ئەوی پێش خست.

کاتێك کرمانی هەڵات، نەسر لەسەر دەروازەی مرو روود، ئوردوی لێدا و وتارێکی پێشکەش بەخەڵکان کرد. سەرکۆنەی کرمانی کرد و وتی: لەکرمان چاوی بەدنیا هەڵهێنا و کرمانی بوو و دواتر ڕۆشتە هەرات و ناوی هورموی لەخۆینا. کەسێك بکەوێتە ناو دوو جێگە، نەرمگ و ریشەیەکی ڕواوی هەیە و نەپەل و پۆپێك شانازی بەخۆیەوە بکات. دواتر سەبارەت بەئەزدییەکان قسەی کرد و وتی: ئەگەر فەرمانبەری بکەن، ریسواترینی خەڵکانن وئەگەر رازی نەبن، لەدووپشك، کوشەندەترن. ئەوان بەو شێوەن کەئەختەل دەڵێت:

ضفادع فی ظلماء لیل تجاوبت فدل علیها صوتها حیة البحر

یانی: بەرازن کە لەشەوێکی تاریك و ڕەش بوونەتە هاوئاوازی یەك و هاواری ئەوان، ماری دەریای بۆ سەر ئەوان، پەلکێش کرد.

دواتر لەوتەکانی خۆی پەشیمان بوویەوە و وتی: بیری خواوەند بکەنەوە چوونکە تەنیا ئەم کارە زیانی بەدواوە نییە.

خەڵکانێکی فراوان لەدەوری نەسر کۆبوونەوە. ئەو سالم کوڕی ئەحوزەی لەگەڵ سوارە زرێپۆشەکان بۆ رووبەڕوو بوونەوەی کرمانی نارد بەڵام خەڵکان لەنێوان کرمانی و نەسر دەستیان بەهاتوچۆ و سەبارەت بەئاشتی، گفتوگۆیان دەکرد. داوایان لەنەسر کرد ئەمانی پێببەخشێت و نەیخاتە زیندان. کرمانی هات و دەستی خستە ناو دەستی نەسر و نەسر فەرمانی پێدا لەماڵەکەی نەیێتەدەر.

دواتر هەواڵێك لەنەسرەوە بەکرمانی گەیشت و ئەو، ڕۆشتە یەکێك لەگوندەکانی خۆی. نەسر هاتەدەر و لەدەروازەی مەرو، ئورودی لێدا. سەبارەت بەو، لەگەڵ نەسر قسەیان کرد و نەسر، ئەمانی پێبەخشی.

نەسر بڕیاریدا بوو لەخوراسان دووری بخاتەوە. سالم کوڕی ئەحوەز پێی وت: ئەگەر دووری بخەیتەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی ناوو ناوبانگ، بەدەست بێنێت ((بیکەیتە پاڵەوانێك!). خەڵکان دەڵێن: لەو ترسا کە بەدەرئەنجامی ئازاد کردن و دوورخستنەوەی ئەو گەیشت. نەسر وتی: ئەوەی لەنەبوونی دەترسم، ئاسانتر لەوەیە کە لەبوونی پێی دەگەم. کاتێك

پیاوێك لەشارەکەی دوور بخرێتەوە، ریسوا دەبێت. ئەوان رازی نەبوون. نەسر ئەمانی پێبەخشی و دەدە بەهاوەڵانی بەخشی. کرمانی ڕۆشتە لای نەسر و نەسر، ئەمانەکەی بەهێز وپشتراست کردەوە.

کاتێك کوڕی جمهور لەفەرمانڕەوایەتی کردنی عێراق، دوورخرایەوە و عەبدواللە کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، هاتەسەر کار، نەسر ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و ئاماژەی بەکوڕی جمهوردا و وتی: لەسەرەتاوە دەمزانی ناتوانێت کارگوزاری عێراق بێت. خوا، ئەوی لەسەر کار لابرد و پیاوێکی خاوەن نەژاد و پاکی بۆ فەرمانڕەوایەتی دیاریکرد.

کرمانی لەخراپ وەسف کردنی کوڕی جمهور تورە و جارێکی دیکە، دەستی بەکۆکردنەوەی پیاوە شەڕکەرەکان کرد. بۆ نوێژی هەینی لەگەڵ هەزار وپێنسەد شەڕکەر، یاکەمتر یا زیاتر، دەهات و لەدەرەوەی هەیوان بۆ نوێژ، دەوەستا. دواتر دەهات و سڵاوی لەنەسر دەکرد و بێ ئەوەی دابنیشێت، بۆ شوێنەکەی خۆی دەگەڕایەوە. بەڵام، دوای وتەکانی نەسر، چیتر نەڕۆشتە لای نەسر و ناسازگاری خۆی ئاشکرا کرد. نەسر بەسالم کوڕی ئەحوەز پەیامێکی بۆ نارد: سوێند بەخوا، من لەزیندانی کردنی تۆ، مەبەستێکی خراپم نەبوو، بەڵکو لەئاژاوەی خەڵکان دەترسام. ئارام بە و بۆ لای من وەرە. کرمانی وتی: ئەگەر لەماڵەکەی مندا نەدەبوویت، دەمکوشتی. بگەڕێرەوە بۆ لای کوڕی دەست براو و ئەوەی دەخوازێت، لەچاك و خراپ، بهێنەرە سەرزمان. سالم کوڕی ئەحوەز بۆ لای نەسرگەڕایەوە و لەوتەکانی کرمانی ئاگاداری کردەوە.. نەسر بەردەوام نێردراوەکانی بۆ لای ئەو ڕەوانە دەکرد. دوایین پەیامی کرمانی ئەمە بوو: ئاسوودە نیم لەوەی دەستەیەك لەخەڵکان بۆ کارێك ناچارت بکەن کەخوازیاری نیت و ئەوکات، تۆ کارێك ئەنجام بدەیت کەهیچ لەپشتییەوە نەمێنێت. ئەگەر دەخوازێت، لێرە دەڕۆم و ئەم کارەم لەترسەوە سەرچاوە ناگرێت بەڵکو لەوە دەترسم ئەم شارە بەئاژاوە و خوێن پیس ببێت. ئەو بۆ ڕۆشتن بۆ جەرجان خۆی ئامادە کرد.

## حارس کوڕی سورەیج و ئەمانی ئەو

لەم ساڵەدا ئەمانیان بەحارس کوڕی سورەیج بەخشی کە لەسەرزەمینی تورکەکان ژیانی بەسەر دەبرد.

بۆ ماوەی دوانزە ساڵ لەوێ مایەوە. فەرمانیان پێدا بۆ خوراسان بگەڕێتەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو کە: کاتێك لەخوراسان لەنێوان نەسر و کرمانی ئاژاوەی

دەستی پێکرد، نەسر ترسا، حارس و هاوەڵانی لەگەڵ تورکەکان هێرشیان بکەنە سەر و گرفتاری و بەڵایەکی گەورەتر لەبەڵاگەی کرمانی بەسەردا بێنن. هیوادار بوو چاکەخوازی ئەو بێت. لەبەر ئەمە، موقاتیل کوڕی حەیانی نبتی و چەند کەسێکی دیکەی ڕەوانە کرد تا لەسەرزەمینی تورکەکان بیگەڕێننەوە. خالید کوڕی زیادی تەرموزی و خالید کوڕی عومەر موالی بەنی عامر ڕۆشتنە لای یەزید کوڕی وەلید و ئەمانیان بۆ حارس وەرگرت. یەزید، ئەمان نامەیەکی نووسی و نەسر فەرمانیدا، هەموو شتەکانی حارس بگەڕێننەوە. فەرمانی بە عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزدا، ئەویش ئەو کارە بکات. ئەم دووانە ئەمانیان وەرگرت و بەرەو کوفە بەرێکەوتن و دواتر ڕێگەی خوراسانیان گرتەبەر. نەسر کەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد. نێردراو چاوی بەنەسر کەوت و لەگەڵ موقاتیل کوڕی سلێمان و هاوەڵانی ڕێگەی گەڕانەوەیان گرتبووەبەر. ڕۆشتە لای نەسر و لەمەروروود مایەوە. نەسر، هەموو سامان و شتەکانی بۆ گەڕاندەوە. گەڕانەوەی ئەو لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی روویدا.

## شوێنکەوتەکانی بەنی عەباس

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی محەممەد(ڕێبەر) باوکی هاشم، بووکەیر کوڕی ماهانی بۆ خوراسان ڕەوانە کرد تا خەڵکان لەپێشنیار و فەرمان و چۆنیەتی هەڵس و کەوت و کردووەکانی ئاگادار بکاتەوە. بووکەیر ڕۆشتە مەرو و شوێنکەوتەکانی لای خۆی کۆکردەوە و نامەکەی ئیبراهیمی بۆ خوێندنەوە و فەرمانی پێدان لەفەرمانەکانی کوڕی ڕێبەر، لایەنگیری بکەن. خەڵکان، بەرێبەرایەتی ئەو رازی و ئەوەی لەخەرجییەکانی شیعەکان کۆیان کردبوویەوە، تەسلیمیان کرد. بووکەیر، سامانەکەی بۆ ئیبراهیم برد.

## بەیعەت لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی وەلید بۆ خەلافەت

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی وەلید فەرمانیدا وەك خەلیفەی جێگیر لەگەڵ ئیبراهیمی برای و دوای ئەو عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج کوڕی عەبدولمەلیك، بەیعەت ببەستن. هۆکارەکەی ئەوە بوو یەزید لەساڵی ١٢٦/ ٧٤٤ زایینی نەخۆش کەوت و پێشنیاریان پێکرد بۆ ئەم دووانە بەیعەت وەربگرێت. خەڵکانی نزیکی یەزید، ئەوەندە بۆ ئەم کارە پێداگریان کرد و فەرمانیدا بۆ ئەم دوو کەسە، بەیعەت لەخەڵکان وەربگرن.

## ناسازگاری مەروان کوڕی محەممەد

لەم ساڵەدا، مەروان کوڕی محەممەد ناسازگاری و دژایەتی خۆی لەگەڵ یەزید کوڕی وەلید ئاشکرا کرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو: کاتێك وەلید کوژرا، عەبدولەلیك کوڕی مەروان کوڕی محەممەد لەگەڵ عومەر کوڕی یەزید برای وەلید (دوای گەڕانەوە لەشەڕی هاوینە) لەحەران، ژیانیان بەسەر دەبرد. فەرمانداری جەزیرە، عەبدە کوڕی ریاحی غەسانی، کارگوزاری وەلید بوو. کاتێك وەلید کوژرا، عەبدە، لەو شارە کۆچی کرد و ڕووی کردە شام. عەبدولەلیك کوڕی مەروان کوڕی محەممەد دەستی بەسەر حەران و جەزیرەدا گرت و نامەی بۆ باوکی لەئەرمەنستان نووسی. لەکارەکان ئاگاداری کردەوە وپێشنیاری پێکرد، لەزووترین کاتدا خۆی بگەیەنێت. مەروان بۆ بەرێکەوتن خۆی ئامادە و کەسانی بۆ سنوورەکان ڕەوانە کرد تا پارێزگاریان لێبکەن. وای نیشاندا مەبەستی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی یەزیدی هەیە. لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و سابت کوڕی نوعەیمی جوزامی لەخەڵکانی فەلەستین، هاورێیەتی دەکرد.

هۆکاری هاورێیەتی سابت ئەوە بوو هوشام، ئەوی زیندانی کردبوو. هۆکاری زیندانی کردنەکەی ئەمە بوو: کاتێك کارگوزارەکەی کولسوم کوڕی عەییاز (فەرمانداری ئەفریقییەیان) کوشت، هوشام ئەوی بۆ ئەفریقییە ڕەوانە کرد. سابت سوپاکەی لەناو برد و هوشامی ئەوی خستە زیندان. مەروان لەیەکێك لەسەردانەکانی خۆی بۆ لای هوشام، داوای ئازادی سابتی کرد. هوشامی ئەوی لەزیندان هێنایە دەر. مەروان وەك هاونشین و هاودەمی خۆی هەڵیبژارد و رێزی لێگرت.

کاتێك مەروان، ئەم رێگەی گرتەبەر. سابت کوڕی نوعەیم بەهاورێکانی مەروان، لەخەڵکانی شامی وت تا پەیوەستی ببن و لەمەروان جیاببنەوە وبۆ شام بگەڕێنەوە. ئەوان رازی بوون. بەم کارە، سستی و لاوازی هاوەڵانی مەروان دەرکەوت و ئەوان پارێزگاریان لەیەك کرد. کاتێك بەرەبەیان بوویەوە، ریزیان بەست و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد. مەروان فەرمانیدا و جارچییەك لەناو دوو ریزی شەڕکەران جاڕیدا: ئەی خەڵکانی شام، بۆ ئەو کارەتان کرد؟ مەگەر چاکەم لەگەڵ ئێوە نەکرد؟ وەڵامیان دایەوە: لەبەر رێزی خەلیفە، فەرمانەکانی تۆمان ئەنجام دەدا. ئەو کوژرا و خەڵکانی شام لەگەڵ یەزید بەیعەتیان

بەستووە و ئێمە سابت کوڕی نوعەیمان وەك سەروەری خۆمان هەڵبژاردووە تا پەیوەستی سوپاکەمان بکات. هاواریان کرد: درۆتان کرد چوونکە خوازیاری ئەو کارە نین، بەڵکو دەتانەوێت لەسەر ڕێگەی خۆتان، ئەمان بەخشراوەکان تالآن بکەن! لەنێوان من و ئێوە تەنیا شمشێر فەرمانڕەوایەتی دەکات تا ملکەچی فەرمانەکانم بن کەهاوشێوەی سەربازەکانی شەڕ بتانبەم و دواتر ئازادتان بکەم تا پەیوەستی سوپاکانی خۆتان بن. ئەوان ڕازی بوون. ئەو سابت کوڕی نوعەیم و بنەماڵەکەی گرت و زیندانی کردن. شەڕکەرانی پاراست تا گەیشتە حەران. زۆرینەی ئەوانی بۆ شام نارد و فەرمانی بەخەڵکانی جەزیرەدا بۆ شەرکەران، زێر و زیو وپێداویستییەکانی دیکە ئامادە بکەن. بۆ بیست و چەند هەزار پیاوی شەڕکەر، کەل و پەل و باروبنەی کۆکردەوە و بۆ لای یەزید بەرێکەوت. یەزید نامەی بۆ نووسی کەتەنیا ئەوەیان پێ ببەخشێت کەعەبدولەلیك کوڕی مەروان، باوکی،(جەزیرە، ئەرمەنستان، موسڵ و ئازەربایەجان) دیاریکردبوو. مەروان بەیعەتی لەگەڵ بەست و یەزید فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچانەی پێبەخشی کەئاماژەمان پێدا.

## مردنی یەزید کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك

لەم ساڵەدا، دە ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی زی حەجە/ ٣ ئۆکتۆبەری ٧٤٤ زایینی، یەزید کوڕی وەلید مرد. ڕۆژگاری خەلافەتی ئەو، شەش مانگ و دوو شەو یا شەش مانگ و دوانزە ڕۆژ یا پێنج مانگ و دوانزە ڕۆژ، درێژەی کێشا. لەدیمەشق چاوی لەجیهان بەست. ساڵەکانی تەمەنی ٥٦ یا ٥٧ ساڵ بوو. دایکی (دایکی منالّ) و ناوی شافەرندە و کچی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی شەهریار کوڕی خوسرەوە. یەزید دەیوت:

انا ابن کسری و ابی مروان　　　　و قیصر جدی و جدی خاقان

یانی: من منالّی خوسرەوم و باوەگەورێی من مەروانە، باوەگەورێیەکی دیکەم سزار و ئەوەی دیکەیان، خاقانە.

لەبەر ئەوە سزار و خاقانی بەباوەگەورێی خۆی ناودەبرد چوونکە دایکی فیروز کوڕی یەزیدگێرد کچی خوسرەو شیرویە کوڕی خوسرەو و دایکی ئەم ژنە، کچی سزار و دایکی شیرویە کچی خاقانی پاشای چین بوو.

دوایین وتە هێنایە سەرزمان، ئەمە بوو: ئەی هاوار، درێغ ، بەداخەوە! نیگاری ئەنگۆستیلە یا مۆرەکەی ئەمە بوو: گەورەیی شیاوە بۆ خوا. یەکەم کەس بوو لەرۆژی جەژن

بەشمشێرەوە هاتەدەر. لەنێوان دوو ریزی شەڕکەر لەسوپاکەی دەرکەوت. دەستەیەك دەڵێن: ئەو دەسەڵات خواز بوو. پیاوێك بوو گەنم ڕەنگ، سەری بچكۆلە و ڕوخسارێكی جوان.

## خەلافەتی ئیبراهیم كوڕی وەلید كوڕی عەبدولمەلیك

كاتێك یەزید كوڕی وەلید مرد، ئیبراهیمی برای، جڵەوی كاروبارەكانی گرتەدەست بەم جیاوازییە كەهیچ كات نەیتوانی كاروبارەكانی خەلافەت سامان بدات چوونكە هەندێ جار وەك خەلیفە سڵاویان بۆ دەنارد و هەندێ كات وەك میرێك و هەندێ كات، بەهیچ شێوەیەك سڵاو و درووديان بۆ نەدەنارد. چوار مانگ یا حەفتا ڕۆژ خەلافەتی كرد و دواتر مەروان كوڕی محەممەد (دواتر ئاماژەی پێدەدەین) هێرشی كردەسەر و لەسەر كار لایبرد. بەڵام زیندوو مایەوە تا لەساڵی ١٣٢/ ٧٥٠ زایینی مرد. نازناوەكەی باوكی ئیسحاق و دایكی، دایكی مناڵە.

## زاڵبوونی عەبدولرەحمان كوڕی حەبیب لەئەفریقییە

عەبدولرەحمان كوڕی ئەبی عوبەیدە كوڕی عوقبە كوڕی نافع، دوای كوژرانی باوكی ئەو و كولسومی عەییاز، لەساڵی ١٢٢/ ٧٤٠ زایینی، تێكشكاو، بۆ ئاندۆلۆس هەڵات. پێشتر ئاماژەمان پێدا. مەبەستی ئەوەی لەسەردا بوو دەست بەسەر ئەم ناوچەیەدا بگرێت، بەڵام نەیتوانی. كاتێك حەنزەلە كوڕی سەفوان فەرمانڕەوایەتی ئەفریقییەی گرتەدەست، ئەبوو خەتاری هاوشێوەی فەرماندار، بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە كرد. لەم كاتەدا عەبدولرەحمان لەهیواكەی بێهیوا و بۆ ئەفریقییە گەڕایەوە و بەشێوەیەكی ترساو لەباوكی خەتار، ژیانی بەسەر دەبرد. ئەو لەتونس، (یەكێك لەشارەكانی ئەفریقییە) بزوتنەوەیەكی دەستپێكرد و ئەمە لەساڵی ١٢٦/ ٧٤٤ زایینی روویدا كەوەلید كوڕی یەزید كوڕی عەبدولمەلیك، لەشام، لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت. خەڵكانی لەدەوری خۆی كۆكردەوە و پێی ڕازی بوون. ئەو، هاورێ لەگەڵ خەڵكان رووی كردە قیروان. خەڵك، مەبەستی شەڕ كردن لەگەڵ ئەویان كرد بەڵام حەنزەلە ڕێگەی لێگرتن چوونكە بڕوای وابوو، لەسەر گرنگیدان بەفەرمانەكانی ئیسلام، نابێت هیچ موسوڵمانێك لەگەڵ موسوڵمانێكی دیكە شەڕ بكات و تەنیا دەبێت ڕووبەرووی ناباوەڕان و خەواریج ببنەوە. حەنزەلە نامەیەكی بۆ نووسی و بەدەستەیەك لەگەورە و سەركردەكانی قیروان، بۆی نارد و پێشنیاری گەڕانەوە و فەرمانبەری پێكرد.

کوڕی حەبیب، نامەکەی وەرگرت وئەوانی زیندانی کرد و وتی: ئەگەر یەك کەس لەخەڵکانی قیروان، یەك بەرد بۆ شارەکەی من بهاوێت، بێ گومان هەموو ئەو کەسانە دەکوژم کەلای منن. کەس شەڕی لەگەڵ نەکرد. حەنزەلە ڕۆشتە شام و عەبدولرەحمان لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی دەستی بەسەر قیروان و ناوچەکانی دیکەدا گرت.

کاتێك حەنزەلە رووی کردە شام، لەخواوەند بۆ لەناو بردنی عەبدولرەحمان و خەڵکی ئەفریقییە پاڕایەوە. خواوەند دۆعاکەی گیرا کرد و بەنەخۆشییەکی کوشندە گرفتاری کردن کەبۆ ماوەی حەوت ساڵ، بەو نەخۆشییەوە دەتلانەوە و تەنیا بۆ ماوەیەکی زەمەنی کورت، بەرۆکی بەردەدان. سەرئەنجام دەستەیەك لەعەرەبەکان و بەربەرەکان دژی عەبدولرەحمان ئاڵای شۆڕشیان هەڵکرد و ماوەیەك دواتر، کوژرا.

لەناو ئەو کەسانەی دژی ئەو راپەڕین، ئەم کەسانە دەبینران: عوروە کوڕی وەلیدی سەدەفی کەدەستی بەسەر تونسدا گرت، باوکی عەتاف عیمران کوڕی عەتاف ئەزدی کەلەتیفاس دابەزی، بەربەرەکان کە لەپانتاییە کوێستانییەکان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و سابت سەنهاجی کەدەستی بەسەر باجەدا گرت.

عەبدولرەحمان، ئەلیاسی برای بانگ کرد و شەشسەد سواری کردە هاورێی و پێی وت: بەرێکەوە تا لەسوپاکەی باوکی عەتاف تێپەڕی و سوپاکەی لەناو ببەیت. کاتێك سوپاکەی، ئەو تۆیان بینی، خۆت لەوان بەدوور بگرە و بەرێکەوە بەشێوەیەك وەك بڵێی مەبەستی هێرش کردنە سەر تونست هەیە و دەخوزایت لەگەڵ وەلید کوڕی عوروە شەڕ بکەیت. کاتێك گەیشتیتە فلانە شوێن، بمێنەرەوە تا فلان کەس ، هاورێ لەگەڵ نامەی من بگاتە لای تۆ و بەپێی فەرمانەکانی من بجووڵێیتەوە.

ئەلیاس بەرێکەوت و عەبدولرەحمان پیاوێکی بانگ کرد. ئەو کەسە بوو سەبارەت بەو لەگەڵ ئەلیاسی برای قسەی کرد. نامەکەی پێدا و پێی وت: بەرێکەوە تا دەگەیتە ناو سوپاکەی باوکی عەتاف. کاتێك ئەلیاس گەشتە سەرەوەی سوپاکەی ئەوان و بینیت کەئەوان خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکەن، خۆتی پێبگەیەنە و نامەکەی منی تەسلیم بکە. پیاوەکە بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو سوپاکەی باوکی عەتاف. ئەلیاس لەوان نزیك کەوتەوە و ئەوان بۆ سوار بوون، خۆیان ئامادە کرد. ئەلیاس لەوان تێپەڕی و ڕێگەی تونسی گرتەبەر. ئارام بوونەوە و وتیان: کەوتە نێوان دوو شێرەوە، ئێمە لێرەوە و خەڵکانی تونس لەوێوە هێرشیان دەکەینە سەر و لەناویان دەبەین. ئەرخەیان بوون و خۆیان بۆ هێرش کردن، ئامادە کرد.

ئەو پیاوە ڕۆشتە لای ئەلیاس و نامەی عەبدولڕەحمانی برای پێ گەیاند. نووسرابوو: ئەم خەڵکە ئاسوودەن، یانی ئاتاگان. هێرشیان بکەسەر و شەڕ لەگەڵ ئەوان ئەزموون بکە. ئەلیاس ئەسپی غاردا و بینی ئارام و ئاسودە لەناو لەشکرگەکەی خۆیان مۆڵیان خواردووە. هێشتا لەبیری ئامادە کردنی کەل و پەلی شەڕ بوون کەهاوشێوەی هەڵۆ لەئاسمانەوە هێرشی کردە سەریان. ئەوانی کوشتار و باوکی عەتاف سەربڕی. لەساڵی ١٣٠/ ٧٤٨ زایینی، ڕۆژگاری ئەوان کۆتایی پێهات. عەبدولڕەحمان نامەی بۆ نووسی و پێی وت پێویستە ڕێگەی تونس بپڕێت. زیادی کرد: کاتێك ئەوان تۆ ببینن، گومان دەکەن باوکی عەتافیت و بەشێوەیەکی ئاسوودە وبێ ترس ژیان بەسەر دەبەن و تۆ دەتوانیت بەسەر ئەواندا زاڵ ببیت.

هێرشی کردە سەر ئەوان و بینی بەهەمان شێوەیە عەبدولڕەحمان، پێشبینی کردبوو. کاتێك گەیشتە سەریان کەسەرۆکەکەیان عوروە کوڕی وەلید لەناو گەرماودا بوو. دەستی بۆ جلەکانی برد کەئەلیاس گەیشتە سەرسەری. خاولییەکەی لەدەوری خۆیەوە ئاڵاند تا خۆی وشك بکاتەوە. بەرووتی پەڕیە سەر ئەسپەکەی و ڕەمی کرد. ئەلیاس بانگی کرد: ئەی سوپاسالاری عەرەبەکان، عوروە گەڕایەوە و ئەلیاس بەشمشێر لێیدا. عوروە ئەوی گرت و هەردووکیان کەوتنە سەرزەوی. زۆری نەمابوو عوروە، ئەلیاس بکوژێت کەیەکێك لەکۆیلەکانی ئەلیاس هات و ئەوی کوشت و سەری بڕی و بۆ عەبدولڕەحمانی نارد.

ئەلیاس لەتونس مایەوە و دوو پیاو لەبەرابەر ئەو بەناوەکانی عەبدجەبار و حارس لەتەرابلس، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ژمارەیەکی فراوان لەخەڵکی ئەوشارەیان کوشتار کرد. عەبدولڕەحمان لەساڵی ١٣١/ ٧٤٩ زایینی هێرشی کردە سەریان و شەڕی لەگەڵ کردن و هەردووکیانی کوشت. ئەوان لەخەواریج و باوەڕیان بەئاپینی ئەبازی بوو.

عەبدولڕەحمان بۆ شەڕ لەگەڵ بەربەرەکان سوپای تەیار کرد و سەرقاڵی ئامادە کردنی خۆی بوو. لەساڵی ١٣٢/ ٧٥٠ زایینی، دیوارەکەی تەرابلسی نۆژەن کردەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ قیروان و شەڕی لەگەڵ تلسمان کرد کەژمارەیەکی فراوان لەبەربەرەکان لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد. عەبدولڕەحمان سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەم ڕووداوە لەساڵی ١٣٥/ ٧٥٢ - ٧٥٣ زایینی ڕوویدا. سوپایەکی بۆ سیسیل ڕەوانە و شەڕیان کرد و توانیان سەرکەوتن و تاڵانی فراوان بەدەست بێنن. سوپایەکی دیکەی بۆ سەروانییە ڕەوانە کرد کەتاڵانییان دەستکەوت و خەڵکانی ڕۆمیان کوشتار کرد. سەراسەری ڕۆژئاوای بڕی و هیچ کام لەسوپاکانی ئەو، شکستیان نەخوارد.

مەروان کوڕی محەممەد کوژرا و فەرمانڕەوایی ئومەوییەکان رووخا بەڵام عەبدولرەحمان هێشتا لەئەفریقییەدا بوو. وتاردەران لەبەرژەوەندی خەلیفەکانی عەباسی، وتاریان دەخوێندەوە و عەبدولرەحمان ملکەچی خۆی بۆ پیاوی خوێنرێژ،(سەفاح) دەربڕی. دواتر دەستەیەك لەئومەوییەکان لای ئەو دابەزین کەخۆی و براکەی، پەیوەندی هاوسەرگیریان لەگەڵ ئەوان بەست. دوان لەوان عاس کوڕی وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك و عەبدولمۆئمن کوڕی وەلید کوڕی یەزید کوڕی عەبدولمەلیك بوون. کچە پووری ئەم دووانە، ژنی ئەلیاسی برای عەبدولرەحمان بوو. عەبدولرەحمانیان ئاگادار کردەوە کەئەوان مەبەستی ئاژاوە نانەوەیان هەیە. هەردووکیانی کوشت. کچە پووری ئەم دووانە بەئەلیاسی هاوسەری وت: براکەت باوکی ژنەکانتی کوشت ورێزی تۆی نەگرت و ریسوایی کردیت. تۆ شمشێری ئەویت کەبەهێزی تۆ شەڕ دەکات. هەرجار کەدەست بەسەر شوێنێکدا دەگریت، بۆ خەلیفەکان دەنووسێت: حەبیبی کوڕم دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرتووە. تۆی لەسەر کار لابردووە و کوڕەکەی خۆی وەك، جێگری خۆی دەستنیشان کردووە. ژن بەردەوام هانیدەدا و ئەلیاس بەوتەکانی ژنەکەی رازی بوو و بیری لەرێگە چارەیەك کردەوە.

سەفاح مرد و دوای ئەو، مەنسوری برای جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست. ئەو، فەرمانڕەوایی عەبدولرەحمان لەئەفریقییە پشتراست و بەهێز کرد و جل و بەرگی ڕەشی بۆ نارد. ئەمە لەسەرەتای خەلافەتی ئەودا بوو. عەبدولرەحمان جلەکانی پۆشی. ئەمە یەکەم جل و بەرگی ڕەش بوو، لەئەفریقییە لەبەر کرا. عەبدولرەحمان دیاریەکی بۆ نارد و نووسی: ئەفریقییە، ئەمڕۆ، هەموو سوچ و کەنارەکانی ئیسلامین و دارایی و کۆیلە کردن، باوی نەماوە، داوای سامان لەمن مەکە. مەنسوڕ توڕە و نامەی بۆ نووسی و ئاگاداری کردەوە. عەبدولرەحمان لەئەفریقییە، دژی مەنسور ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و جلەکانی ئەوی لەسەر تەختی وتاردان، دڕاند. شۆڕش دژی مەنسور یەکێك لەو کارانە بوو کەئەلیاسی برای، بوێرتر کرد. دەستەیەك لەگەورەکانی ئەفریقییە لەگەڵ ئەلیاس، بۆ کوشتنی عەبدولرەحمان، پەیمانیان بەست تا ئەلیاس بێننە سەرکار و جارێکی دیکە، ملکەچی فەرمانەکانی مەنسور ببن. عەبدولرەحمان ئاگادار بوویەوە و فەرمانی بەئەلیاسدا بۆ تونس بڕوات. خۆی ئامادە کرد و ڕۆشتە لای عەبدولرەحمان تا ماڵئاوایی لێبکات. عەبدولوارسی برای هاورێیەتی دەکرد. کاتێك ڕۆشتنە لای عەبدولرەحمان، کوشتیان. کوژرانی ئەو لە زی

حەججەی ١٣٧/ مەی ٧٥٥ زایینی روویدا. بۆ ماوەی دە ساڵ و حەوت مانگ فەرمانڕەوایەتی ئەفریقییەی کرد.

کاتێك عەبدولرەحمان کوژرا، ئەلیاس دەروازەکانی گرت تا حەبیب کوڕی عەبدولرەحمان دەستگیر بکات. حەبیب ڕۆشتە تونس و دەستی خستە ناو دەستی عیمرانی مامی و پێی وت کەئەلیاس باوکی کوشتم. ئەلیاس بۆ شەڕی ئەم دووانە بەرێکەوت. شەڕێکی سووکیان تاقی کردەوە و دواتر لەسەر ئەم خاڵانە پەیمانی ئاشتیان مۆر کرد کەقەفسە و قوستەتیە و نەفزادە، لەژێر دەستی فەرمانڕەوایەتی حەبیبدا بێت و جەزیر بۆ عیمران و پانتاییەکانی دیکەی ئەفریقیە لەژێر دەستی فەرمانڕەوایەتی ئەلیاسدا بێت. حەبیب کوڕی عەبدولرەحمان ڕۆشتە سەر کارەکەی خۆی و ئەلیاس و براکەی عیمران، ڕۆشتنە تونس. ئەلیاس خیانەتی لەبراکەی کرد و ئەوی کوشت و دەستی بەسەر تونسدا گرت و دەستەیەك لەگەورەکانی عەرەبی لەو وڵاتە کوشتار و بۆ قیروان گەڕایەوە. کاتێك لەقیروان ئارامی گرت، دەستەیەکی (عەبدولرەحمان کوڕی زیاد کوڕی ئەنعەم دادیاری ئەفریقییە لەناو ئەواندا دەبینرا) بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای مەنسور ڕەوانە و ملکەچی خۆی ڕاگەیاند.

حەبیب ڕۆشتە تونس و دەستی بەسەردا گرت. ئەلیاس بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بەرێکەوت و شەڕێکی ئەزۆر دژواریان دەست پێکرد. کاتێك تاریکی شەو، باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشا، حەبیب، خێوەتەکانی خۆی بەجێهێشت و بەرەو قیروان بەرێکەوت. ڕۆشتە قیروان و زیندانییەکانی هێنایەدەر و بەمشێوەیە ژمارەی سوپاکەی فراوان بوو.

ئەلیاس شوێنی کەوت بەڵام زۆربەی هاوەڵانی لەدەروی ئەو بڵاوەیان لێکرد. سوپاکەی حەبیب فراوان و هاوەڵانی ئەلیاس خیانەتیان لێکرد. حەبیب هاتە ناو دوو سوپاکە و پێی وت: بۆ خزم و کەس و کاری خۆمان بکوژین؟ بۆ شەڕی من وەرەدەر، هەرکام ئەوی دیکەی کوشت، لەئازار و ڕەنجەکانی رزگاری دەبێت. ئەلیاس کەمێك چاوەڕوان و دواتر روبەرووی بوویەوە. شەڕیان کرد تا ئەوەی ڕم و شمشێرەکانیان شکا. حەبیب هێرشی کردەسەر و ئەوی کوشت و ڕۆشتە ناو قیروان. ئەم رووداوە لەساڵی ١٣٨/ ٧٥٥- ٧٥٦ زایینی روویدا.

براکانی ئەلیاس بۆ لای هۆزێك لەبەربەرەکان بەناوی وەرفوجەمە بەرێکەوتن. لەوێ مانەوە و گیانیان پاراست. حەبیب هێرشی کردە سەرئەوان و شەڕی لەگەڵ ئەزمون کردن. ئەوان توانیان حەبیب تێکبشکێنن. ئەو، بەرەو قابس بەرێکەوت. لەم کاتەدا خەڵکانی وەرفوجەمە بەهێز و بەربەرەکان و خەواریج پەیوەستیان بوون. سەرکردەی وەرفوجەمە،

پیاوێك بەناوی عاسم کوڕی جەمیل بوو. ناوی پێغەمبەری لەخۆینا و خەڵکانی فریودا. ئایینێکی تازەی هێنایە کایەوە و ژمارەی نوێژەکانی زیاد و ناوی پێغەمبەری لەبانگدا سڕییەوە. عاسم عەرەبەکانی نیشتەجێی وەرفوجەمەی بۆ شەڕ ئامادە و مەبەستی هێرش کردنە سەر قیروانی کرد. نێردراوانی دەستەیەك لەخەڵکانی قیروان ڕۆشتنە لای و داوایان لێکرد بەرەو شارەکەیان بەڕێکەوێت و سوێند و بەڵێنی هاوکاری وپشتیوانی کردن و پاراستنی فەرمانەکانی مەنسور و هاندانی خەڵکان بۆ پەیوەست بوون بەبنەماڵەی عەباسیان، پێدا. عاسم لەگەڵ عەرەبەکان و بەربەرییەکان بەڕێکەوت. کاتێك لەقیروان نزیك کەوتنەوە، دانیشتوانی ئەم شارە ڕوبەروویان بوونەوە. خەڵکانی قیروان شکستیان خوارد و عاسم و سوپاکەی ڕۆشتنە ناو شارەکە. خەڵکانی وەرفوجەمە، ڕێزی ژنەکانیان نەگرت و ژن و منداڵەکانیان ئەسیر و چوارپێکانی خۆیان لەناو مزگەوتەکاندا بەستەوە و پیساییان تێکرد.

عاسم شوێن حەبیب کەوت کە لەقابس بوو. ڕووبەرووی بوویەوە و شەڕ دەستی پێکرد. حەبیب شکستی خوارد و بۆ کوێستانی ئەوراس هەڵات و لەوێ پەنای گرت و بۆ شەڕ و خۆڕاگری خۆیان ئامادە کرد. عاسم دووبارە پێیان گەیشتەوە و شەڕیان دەستپێکردەوە. عاسم و زۆربەی هاوەڵانی کوژران و حەبیب ڕووی کردە قیروان. عەبدولمەلیك کوڕی ئەبی جەعد (کەدوای عاسم سەرکردەی خەڵکانی وەرفوجەمە بوو) ڕوبەرووی بوویەوە. شەڕ دەستی پێکرد و حەبیب شکستی خوارد و لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی کوژرا. ئەم ڕووداوە لەموحەرەمی ١٤٠/ ٧٥٧ زایینی ڕوویدا.

فەرمانڕەوایی عەبدولرەحمان کوڕی حەبیب لەئەفریقییە دە ساڵ و چەند مانگ درێژەی کێشا. فەرمانڕەوایەتی براکەی، ئەلیاس، یەك ساڵ و شەش مانگ و کوڕەکەی حەبیب بۆ ماوەی سێ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## دەرپەڕاندنی خەڵکانی وەرفوجەمە لەقیروان

کاتێك حەبیب کوڕی عەبدولرەحمان کوژرا، عەبدولمەلیك کوڕی ئەبی جەعد بۆ قیروان گەڕایەوە و دەستی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە درێژ کرد کەعاسم ئەنجامیدەدا: خراپەکاری، ستەمکاری، وێرانکردن، گۆڕینی ئایین و کردەوەکانیتر. خەڵکانی قیروان شارەکەیان بەجێهێشت.

پیاوێك لەئەبازییەکان بەمەبەستێکی کارێك، ڕووی لەقیروان کرد. بینی دەستەیەك

لەخەڵکانی وەرفوجەمە ژنێکیان بەزۆر گرتووە و بۆ مزگەوتی دەبەن و پیاوەکان سەیریان دەکەن. ژنەکەیان بردە ناو مزگەوتەکە. پیاوی ئەبازی کارەکەی خۆی بەجێهێشت و رووی کردە دەرگای ئەبوو خەتاب کوڕی عەبدی ئەعلا کوڕی سەمحی مەعافری و ئەوی لەم کارە ئاگادار کردەوە. ئەبوو خەتاب، شڵەژاو هاتە دەر و بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە، ماڵەکەت، فریای ماڵەکەت بکەوە. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و مەبەستی تەرابلسی رۆژئاوایان کرد. خەڵکان لەئەبازی و خەواریج و شوێنەکانی دیکە لەدەوری کۆبوونەوە. عەبدولەلیک، سەرکردەی وەرفوجەمە، سوپایەکی بۆ شەڕی ئەوان نارد کەشکستیان پێهێنان و بەرەو قیروان بەرێکەوتن. خەڵکانی وەرفوجەمە رووبەروویان بوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. خەڵکانی قیروان کە لەگەڵ خەڵکانی وەرفوجەمەدا بوون، هەڵاتن و هاوکاریان نەکردن. وەرفوجەمەییەکان بەدوای ئەوان هەڵاتن و ژمارەی کوژراوەکان لەناو ئەواندا فراوان بوو. عەبدولەلیک کوڕی ئەبی جەعد کوژرا. ئەبوو خەتاب شوێنیان کەوت و لەکوشتار کردنی ئەوان بەردەوام بوو و لەم کارەدا سنوورەکانی بەزاند. دواتر بۆ تەرابلس گەڕایەوە و عەبدولرەحمان کوڕی رۆستەمی پارسی وەك جێگری خۆی لەقیروان دانا.

کوژرانی خەڵکانی وەرفوجەمە لەسەفەری ساڵی ١٤١/ ٧٥٨ زایینی روویدا.

دواتر محەممەد کوڕی ئەشعەسی خوزاعی فەرمانداری میسرلەلایەن مەنسورەوە، دەستەیەکی فراوان لە ڕەشپێستەکانی بۆ شەڕ لەگەڵ باوکی خەتاب بەسەرکردایەتی باوکی ئەحوەس عومەر کوڕی ئەحوەسی عیجلی، بەرەو تەرابلس برد. ئەبوو خەتاب رووبەروویان بوویەوە و ساڵی ١٤٢/ ٧٥٩ زایینی، شکستی پێهێنان. ئەوان بۆ میسر گەڕانەوە و ئەبووخەتاب دەستی بەسەر ناوچەکانی دیکەی ئەفریقییەدا گرت. مەنسور، محەممەد کوڕی ئەشعەسی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە ڕەوانە کرد. ئەو لەساڵی ١٤٣/ ٧٦٠ زایینی لەمیسرەوە بەرێکەوت و هاوڕێ لەگەڵ پەنجا هەزار شەڕکەر، گەیشتە ئەفریقییە. هاوڕێ لەگەڵ ئەو، ئەغلەب کوڕی سالمی تەمیمی ڕەوانە کرد. باوکی خەتاب لەهاتنی ئەوان ئاگادار و شەڕکەرانی خۆی لەهەموو سوچ و کەنارەکان کۆکردەوە و ژمارەی سوپاکەی فراوان بوو. کوڕی ئەشعەس، لەفراوانی سوپاکەی ئەو ترسا.

لەم کاتەدا خەڵکانی زەناتە و هۆزی هەوارە لەسەر کوژرانی ژنێك لەخەڵکانی زەناتە گرفتاری کێشە بوون. خەڵکانی زەناتە سەرکۆنەی ئەبوو خەتابیان کرد کەلایەنگری لەدوژمنەکەیان دەکات. دەستەیەك لەوان، جیابوونەوە و بەمشێوەیە کوڕی ئەشعەس بەهێز

و بێ کێشە، پێشڕەوی دەستپێکرد. سەرەتا وای نیشاندا کەمەنسوری (تاك دیناری، لەبەر ئەوەی کەسێکی سوالکەرئاسا بوو پێیان دەوت، دوانیقی،) فەرمانی گەڕانەوەی پێداوە. سێ ڕۆژ بەهێواشی ڕێگەی بڕی. هەواڵبەران، ڕۆشتنە لای باوکی خەتاب و پێیان وت کوڕی ئەشعەس مەبەستی گەڕانەوەی هەیە. زۆربەی سوپاکەی بلاوەیان لێکرد و ئەوانیتر بێ خەم، پاڵیان دایەوە. کوڕی ئەشعەس و بوێرەکانی سوپاکەی، چوست و چالاك گەڕانەوە و شمشێریان خستە ناویان. شەڕ ڕووی لەدژواری کرد. ئەبوو خەتاب و زۆربەی هاوەلانی لەصەفەری ساڵی ١٤٤/ ٧٦١ زایینی، کوژران.

کوڕی ئەشعەس گومانی دەکرد ڕەگ و ریشەی خەواریجی دەرهێناوە. لەناکاو بینیان ئەبوو هورەیرەی زەناتی بەشانزە هەزار پیاوی شەڕکەر، هێرشی هێناوە. کوڕی ئەشعەس لەساڵی ١٤٤، ٧٦٣ زایینی ڕوبەڕوویان بوویەوە و هەموویانی کوشتار کرد و دیواری قیروانی بەدەوری شارەکەدا دروست کرد کە لەساڵی ١٤٦/ ٧٦٣ زایینی، کۆتایی پێهات. بەدوای هەموو نەیارەکانی خۆی لەبەربەرەکان و عەرەبەکان گەڕا و سوپای بۆ وەران و زوبلە برد. دەستی بەسەر وەراندا گرت و خەواریجی ئەو شارەی کوشتار کرد و ئەبازییەکانی لەناو برد و کەسانی دیکەی بۆ کۆچ کردن فەرماندا. کاتێك بەربەرییەکان و ئاژاوەچییەکان، چۆنیەتی مامڵە کردنی ئەویان لەگەڵ خراپەکاران بینی، ترسان و ملکەچی خۆیان نیشاندا. پیاوێك لەسوپاکەی بەناوی هاشم کوڕی شاحج لەقەمونییە لەبەرابەر ئەو، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ژمارەیەك لەسوپاکەی، بەجێیان هێشت. کوڕی ئەشعەس یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد کەهاشمی کوشت و سوپاکەی تێکشکاند. موزەرییەکان لەناو فەرماندەکانی کوڕی ئەشعەس، بەردەوام هاوەلانی خۆیان بۆ پەیوەست بوون بەهاشم هاندەدا و ئەمەیان لەبەر دوژمنایەتی کردنی کوڕی ئەشعەس دەکرد چوونکە بەرابەر ئەوان سەختگیر بوو. کوڕی ئەشعەس سوپایەکی دیکە بۆ شەڕی نارد کەشەڕیان کرد و هاشم، شکستی خوارد و بۆ تاهرت هەلات و ئاژاوەچییەکانی بەربەڕی لەدەوری خۆی کۆکردەوە بەشێوەیەك ژمارەی سوپاکەی گەیشتە بیست هەزار کەس. ئەوانی بۆ پانتاییەکانی تەهوزە برد. کوڕی ئەشعەس سوپایەکی بۆ لەناو بردنی ئەوان ڕەوانە کرد. هاشم شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەبەربەرەکانی ناو سوپاکەی کوشتار کران. هاشم بۆ پانتاییەکانی تەرابلس بەرێکەوت.

لەم کاتەدا نێردراوی مەنسور گەیشتە لای هاشم و سەرکۆنەی کرد. وتی: من ئاڵای

شۆڕشم بەرز نەکردۆتەوە بەڵام پێشنیاری بەیعەت بەستن لەگەڵ مەهدی (سێیەم خەلیفەی عەباسی) بەخەڵکان دەکەم. کوڕی ئەشعەس ئەمەی پەسەند نەکرد و بیری لەکوشتنی من کردەوە. نێردراو وتی: ئەگەر ڕاست دەکەیت و هێشتا ملکەچی فەرمانەکانیت، سەر دانەوێنە. ئەو سەری دانەواند و نێردراو لەمانگی سەفەری ١٤٧ زایینی/ ئاوریلی ٧٦٤ زایینی ئەوی کوشت و ئەمانی بەهەموو هاوەڵانی هاشم بەخشی کەبۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە.

کوڕی ئەشعەس شوێنیان کەوت و یەك یەك، ئەوانی لەناو برد. موزەرییەکان تووڕە بوون و بۆ ناسازگاری و دژایەتی کردنی ئەو، پەیمانیان بەست. بڕیاری دەرکردنی ئەویاندا. کاتێك ئەمەی بینی، کۆچی کرد. نێردراوانی مەنسوری تاك دیناری بەو پەڕی ڕێزەوە، پێشوازیان لێکرد. ئەو ڕۆشتە لای مەنسورو موزەرییەکان دوای ئەو عیسا کوڕی موسای خوراسانیان وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە هەڵبژارد.

دوای بەرێکەوتنی کوڕی ئەشعەس، فەرمانڕەوایی خوراسانی، سێ مانگ، درێژەی کێشا. مەنسور، بەهەمان شێوە ئاماژەی پێدەدەین، ئەغلەبی تەمیمی بۆ ئەو ناوچەیە ڕەوانە کرد. ئەم پێشهاتە لەمانگی ڕەبیع الاولی ١٤٨ زایینی، مەی ٧٦٥ زایینیدا ڕوویدا.

بۆیە ئەم ڕوداوانەمان پێکەوە باس کرد چوونکە پەیوەستی یەك بوون و ئەم سەرچاوەی لەو پەیمان و بەڵێنەوە گرتووە کە لەسەرەتادا، بەڵێنمان داوە. هەر پێشهاتێکمان لەساڵی ڕوودانی خۆیدا باس کرد و بەدوو مەبەست گەیشتین.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی وەلید، یوسف کوڕی محەممەد کوڕی یوسفی لەفەرمانڕەوایی مەدینە لابرد و عەبدولعەزیز کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمانی هێنایە سەرتەخت و عەبدولعەزیز لە زیقەعدەی ئەم ساڵە/ ئوتی ٧٤٤ زایینی گەیشتە مەدینە. عەبدولعەزیز کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

فەرمانداری عێراق عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، دادیاری کوفە، کوڕی باوکی لەیلا، فەرمانداری بەسرە، مسوەر کوڕی عومەر کوڕی عیباد، دادیاری بەسرە، عامر کوڕی عوبەیدە و لەخوراسان، نەسر کوڕی سەیاری کەنانی فەرمانڕەوایەتی دەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەروان کوڕی محەممەد لەگەڵ فەرمانداری جەزیرە، عومەر کوڕی

یەزید کوڕی عەبدولمەلیك، نامەیان بۆ یەکتر نارد و بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی وەلیدی برای، هانیدا و بەڵێنی پێدا لەم کارەدا هاوکاری بکات.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: سەعد کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی مرد، سەعید کوڕی ئەبی سەعیدی مەقبەری، مالك کوڕی دینار کەدەستەیەك دەڵێن لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی یا لەساڵی ١٣٠/ ٧٤٧- ٧٤٨ زایینی چاوی لەجیهان بەست. لەساڵی ٦٠/ ٦٨٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا، عەبدولرەحمان کوڕی قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەبووبەکری سدیق کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣١/ ٧٤٨- ٧٤٩ زایینی مرد و ئەبوو جومەری زەبعی هاوڕێی کوڕی عەباس کە لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی یوسف کوڕی عومەر، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و حەوتی کۆچی (( ٧٤٥ زایینی ))

### بەرێکەوتنی مەروان بۆ شام و لەسەر کارلابردنی ئیبراهیم

لەم ساڵەدا مەروان، بۆ شەڕ لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی وەلید و لەناو بردنی ئەو، بەرەو شام بەرێکەوت.

هۆکارەکەی ئەوە بوو پێشتر ئاماژەمان پێدا. مەروان دوای کوژرانی وەلید، بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوەی ئەو، شۆڕشی دەستپێکرد و دەستی بەسەر جەزیرەدا گرت و کاتێك یەزید ئەوی کردە فەرمانڕەوای سنوری فەرمانڕەوایەتی باوکی، لەبەرژەوەندی ئەو (یەزید کوڕی وەلید) بەیعەتی گرت و بەیعەتی لەخەڵکان وەرگرت.

کاتێك یەزید کوڕی وەلید مرد، مەروان لەگەڵ سوپاکەی بەرەو جەزیرە بەرێکەوت و کوڕەکەی عەبدولمەلیك کوڕی مەروانی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان، لەشاری ڕەققە بەجێهێشت. کاتێك مەروان گەیشتە قێنسرین، لەوێ چاوی بەبیشر کوڕی وەلید کەوت. یەزید کوڕی وەلید، ئەوی وەك فەرماندار دەستنیشان کردبوو. لەبەرابەر یەك ریزیان بەست و مەروان پێشنیاری فەرمانبردن لەخۆی پێکردن. یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە و خەڵکانی قەیس، پەیوەستیان بوون و بیشر کوڕی وەلید و براکەی مەسرور کوڕی وەلیدیان بەجێهێشت کەمەروان هەردووکیانی خستە زیندان و هاورێ لەگەڵ خەڵکانی قێنسرین، ڕووی کردە حمس.

خەڵکی حمس دوای گەڕانەوەی یەزید کوڕی وەلید، لەبەیعەت و فەرمانبردنی ئیبراهیم کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك و عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج کوڕی عەبدولمەلیك، خۆیان بەدوور گرت. ئیبراهیم، عەبدولعەزیزی وەك فەرماندەی سوپاکەی دیمەشق دەستنیشان و بۆ ڕووبەروو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد و لەشارەکەیان گەمارۆی خستنەسەر. مەروان بەخێرایی بەرێکەوت و کاتێك لەحمس نزیك کەوتەوە، عەبدولعەزیز، لەوێ ڕۆشت. خەڵك پێشوازیان لەمەروان کرد و بەیعەتیان لەگەڵ بەست و لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. ئیبراهیم کوڕی وەلید، شەڕکەرانی دیمەشقی بەسەرکردایەتی سلێمان کوڕی هوشام ڕەوانە کرد. ئەو، لەگەڵ سەد وبیست هەزار شەڕکەر، لەعەین ئەلجەر، دابەزی و مەروان بەسوپایەکی هەشتا هەزار کەسی، لەوێ ئوردوی لێدا. مەروان پێشنیاری شەڕنەکردن و ئازاد کردنی دوو کوڕی

خەلیفەی پێشوو حەکەم کوڕی وەلید و عوسمان کوڕی وەلیدی لەزیندان پێکردن و بەڵێنیدا تۆڵە لەهیچ کام لەبکوژەکانی وەلید ناکاتەوە. ئەوان رازی نەبوون و رێگەی ناسازگاریان گرتەبەر. هەردوو سوپا، لەبەرەبەیانەوە تا ئاوا بوونی خۆر، بەشێوەیەکی نەزۆر دژوار، شەڕیان کرد و ژمارەیەکی زۆر کوژران.

مەروان پیاوێکی دوورئەندێش و فێڵباز بوو. سێ هەزار سوارەی بۆ پشتی سوپاکەی دوژمن نارد کە لەرووبار پەڕینەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر سوپاکەی ئیبراهیمیان کرد. سلێمان و هاوەڵانی نەکەوتبوونە خۆ و سەرقاڵی شەڕ کردن بوون کەبینیان سوارەکان، شمشێر بەدەست لەپشتەوە هێرشیان کردووە. کاتێک ئەمەیان بینی، هەڵاتن وخەڵکانی حمس، شمشێریان خستە ناویان چوونکە ڕقی ئەوانیان لەدڵدا بوو. حەڤدە هەزار کەسیان کوشت. خەڵکانی جەزیرە و قێنسرین دەستیان لەکوشتاری ئەوان هەڵگرت و هاورێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەئەسیرەکان بۆ لای مەروان گەڕانەوە. مەروان لەوان، بەیعەتی بۆ دوو کوڕەکەی وەرگرت و ئەوانی ئازاد کرد جگە لەدوو کەس کەئەوانی کوشت: یەکیان وەلید کوڕی موسادی کەلبی و ئەوی دیکەیان یەزید کوڕی عەقاری کەلبی. ئەم دووانە لەو کەسانە بوون کەکوشتنی وەلیدیان لەئەستۆ گرتبوو. ئەم دووانەی زیندانی کرد و لەزینداندا، مردن. یەزید کوڕی خالید کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری لەگەڵ سلێمان و کەسانیتر، بەرەو دیمەشق هەڵاتن و لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی وەلید و عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج کۆبوونەوە. بەیەکیان وت: ئەگەر دوو کوڕەکەی وەلید زیندوو بمێننەوە، کاتێک مەروان ئەوان ئازاد بکات، کاروبارەکان بەوان دەسپێرێت کەئەوانیش هیچ کام لەبکوژەکانی باوکیان بەزیندووی ناهێڵنەوە. بۆچوونی پەسەند و راست، کوشتنی ئەم دووانەیە. یەزید کوڕی خالید ئەمەی پەسەند کرد و فەرمانی بەباوکی ئەسەددا، (یەکێک لەکۆیلەکانی خالید) بیانکوژێت. ئەو یوسفی هێنایە دەر و کوشتی. مەبەستی ئەوەیان کرد باوکی محەممەدی سوفیانی بکوژن بەڵام ڕۆشتە ناو یەکێک لەژوورەکانی زیندان و دەرگای لەسەر خۆی بەست و نەیانتوانی بیکوژن. ویستیان زیندانەکە بسوتێنن بەڵام پێش ئەوەی ئەو کارە بکەن، پێیان وترا مەروان هاتۆتە ناو شارەکە. هەڵاتن و ئیبراهیم هەڵات و خۆی شاردەوە. سلێمان، هەرچی لەگەنجینەکەدا بینی، تالانی کرد و لەناو هاوەڵانی خۆی، دابەشی کرد و لەشارەکە ڕۆشتەدەر.

## بەیعەت بۆ مەروان کوڕی محەممەد کوڕی مەروان

لەم ساڵەدا بۆ مەروان، لەدیمەشق، بەیعەت وەرگیرا.

چۆنیەتیەکەی: کاتێك ڕۆشتە ناو دیمەشق و ئیبراهیم کوڕی وەلید و سلێمان هەڵاتن، کەسانێك لەکۆیلەکان و مواڵییەکانی وەلید لەدیمەشق، هێرشیان کردە سەر ماڵی عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج کوڕی عەبدولمەلیك و ئەویان کوشت و گۆڕەکەی یەزید کوڕی وەلیدیان هەڵدایەوە و جەستەی ئەویان هێنایە دەر و لەدەروازەی جابییە، هەڵیانواسی. دوو کوڕە کوژراوەکە (حەکەم کوڕی وەلید و عوسمان کوڕی وەلید) لەگەڵ یوسف کوڕی عومەریان بردە لای مەروان و فەرمانیدا، هەر سێکیان بەخاك بسپێرن. باوکی محەممەدی سوفیانیان بردە لای ئەو کەدەست و پێی لەزنجیردا بوو. وەك خەلیفە سڵاوی بۆ مەروان نارد. مەروان وتی: بێدەنگ بە! باوکی محەممەد وتی: ئەو دووانە، دوای خۆیان، خەلافەتیان بەتۆ سپارد. هۆنراوەیەکی بۆ خوێندەوە کەحەکەم لەزیندان، نووسیبووی. ئەم دوو کوڕە، گەشتبوونە تەمەنی گەورەیی و یەکیان، حەکەم، منالی بۆ هاتبووە دنیا. حەکەم وتبووی:

| | |
|---|---|
| الا من مبلغ مروان عنی | و عمی الغمر طال به حنینا |
| بانی قد ظلمت و صار قومی | علی قتل الولید مشایعینا |
| ایذهب کلهم بدمی و مالی | فلا غثا اصبت و لا سمینا |
| و مروان بارض بنی نزار | کلیث الغاب مفترس عرینا |
| اتنکث بیعتی من اجل امی | فقد بایعتهم قبلی هجینا |
| فان اهلك انا و ولی عهدی | فمروان امیر المؤمنینا |

یانی: کێیە، پەیامی من بۆ مەروان و غومر ببات چوونکە شەیدایی بینینی ئەوم و ڕۆژگارێکە چاوەڕوانی دیتنی دەکەم. پێی بڵێت ستەمم لێکرا و خەڵکانی من بۆ کوشتنی وەلید هاودەست بوون. ئایا هەمووی ئەوان سامانەکانی من دەبەن و خوێنی من بێ گوناح، دەرژێنە سەرزەوی؟ نەقەڵەوی تاقیم کردۆتەوە نە لاغری. ئێستا مەروان لەسەرزەمینی بەنی نەزارە، شێری دارستانی ژیانە کە لەکونەکەی خۆیدا پاڵکەوتووە، ئایا دەبێت پەیمانەکەی من بەهۆکاری خراپەکاری دایکم، بپچڕێنن؟ مەگەر ئەوە نەبوون پێش من، دەستی فەرمانبەریتان بۆ کەسێك درێژ کرد کەتەنیا باوکی عەرەب بوو بەڵام دایکی وەك کەنیزێك هەژمار دەکرا؟ ئەگەر من و تەختی خەلافەتەکەم، لەناو بچین، بزانن مەروان سەروەری

باوەڕدارانە.

دواتر وتی: دەستت بێنە تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستم. ئەوانەی هاوڕێی مەروان بوون، ئەمەیان بیست. یەکەم کەس بەیعەتی لەگەڵ کرد، معاویە کوڕی یەزید کوڕی حوسەین کوڕی نەمر بوو کەدوای ئەو، سەرانی شاری حمس و کەسانی دیکە، بەیعەتیان لەگەڵ بەست. کاتێك کاروبارەکانی سەقامگیر کرد، بۆ ماڵەکەی خۆی لەحەڕان گەڕایەوە. داوای ئەمانیان بۆ ئیبراهیم کوڕی وەلید و سلێمان کوڕی هوشام کرد و ئەمانی پێ بەخشین. ئەوان ڕۆشتنە لای مەروان. سلێمان و براکانی و هەموو بنەماڵەکەی و کۆیلەکان و خزمەکانیان کە لەتەدمور، ژیانیان بەسەر دەبرد، لەگەڵ مەروان، بەیعەتیان بەست.

## بزوتنەوەی عەبدوالله کوڕی معاویە کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی معاویە کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب لەکوفە، ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە.

چۆنیەتیەکەی: ئەو، لەکوفە بوو بەمیوانی عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کەرێزی گرت و بەخۆی و براکانی ڕۆژانە سێسەد درەمی دەبەخشی. بەمشێوەیە بوون تا ئەو کاتەی یەزید کوڕی وەلید لەناوچوو و خەڵکان لەگەڵ براکەی ئیبراهیم کوڕی وەلید و دوای ئەو لەگەڵ عەبدولعەزیز کوڕی حەجاج کوڕی عەبدولمەلیك بەیعەتیان بەست. کاتێك هەواڵی بەیعەتی ئەوان بەعەبدوالله کوڕی عومەر لەکوفە گەیشت، لەگەڵ خەڵکان بەیعەتی کرد. بەخششەکانی زیاد و چۆنیەتی بەیعەت کردنی بۆ سووچ و کەنارەکان ڕەوانە کرد و لەهەموو شوێنێك لەخەڵکان بۆ ئەوان، بەیعەتی وەرگرت. دواتر ئاگادار بوویەوە مەروان بەیعەتی نەکردووە و بەرەو شام بەرێکەوتووە. ئەو، عەبدوالله کوڕی معاویەی لای خۆی زیندانی کرد و بەخششەکانی ئەوی زیاد کرد. ئەوی بۆ مەروان ئامادە کرد تا ئەگەر بەسەر ئیبراهیم کوڕی وەلیددا سەرکەوتن، لەگەڵ ئەو (عەبدوالله) بەیعەت بکات و بەهاوکاری ئەو، دژی مەروان بووەستێتەوە.

مەروان ڕۆشتە شام و بەسەر ئیبراهیمدا سەرکەوت. ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله قەسری بەپەلە هاتە کوفە و نامەیەکی لەسەر زمانی ئیبراهیم سەبارەت بەفەرمانڕەوایەتی کوفە، خوێندەوە. خەڵکانی یەمەنی کۆکردەوە و ئاگاداری کردنەوە. وەڵامیان دایەوە بەڵام عەبدوالله کوڕی عومەر ڕازی نەبوو و ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر.

کاتێك کاروبارەکانی بەمشێوەیە بینی، ترسا ڕاستییەکان ئاشکرا و ڕیسوا ببێت و بکوژرێت. بەهاوەڵانی خۆی وت: لەخوێنڕێژی بێزارم، دەست لەشەڕ هەڵبگرن. ئەوان دەستیان هەڵگرت و چاوەڕوان بوون. داستانی هەڵاتنی ئیبراهیم لەهەموو شوێنێك، بڵاو بوویەوە و سەختگیری و توند وتیژی لەناو خەڵکان پەرەی سەند. هۆکارەکەی ئەوە بوو عەبدوالله کوڕی عومەر، بەموزەرییەکان و خەڵکانی ڕەبیعە، بەخششی فراوانی بەخشیبوو بەڵام جەعفەر کوڕی نافیع کوڕی قەعقاع کوڕی شوری زوهەلی و عوسمان کوڕی خەیبەری (هەردووکیان لەتیم اللات کوڕی سەعلەبە، لەخەڵکانی ڕەبیعە) بێ بەش کردبوو. ئەم دووانە تووڕە و بێزار بوون. لەتووڕەی ئەم دووانە، سەمامە کوڕی حەوەشب کوڕی ڕویەمی شەیبانی هاتە جۆش و هەر سێکیان لەشارەکەی عەبدوالله کوڕی عومەر هاتنەدەر و جاڕیاندا: ئەی خەڵکانی ڕەبیعە! خەڵکانی ڕەبیعە کۆبوونەوە و خۆیان ئامادە کرد.

ئەم هەواڵە بە عەبدوالله کوڕی عومەر گەیشت و براکەی، عاسمی بەدوای ئەواندا نارد. عاسم ڕۆشتە لای ئەوان و وتی ئەمە دەستی منە، داوەری بکەن. ئەوان، شەرم دایگرتن. هەموویان گەڕانەوە وڕێزیان لەعاسم گرت. کاتێك شەو داهات، عەبدوالله کوڕی عومەر بۆ عومەر کوڕی غەزەبانی قەبەعسەری سەد هەزار درەمی ڕەوانە کرد تا لەناو خەڵکەکەی بەنی هومام کوڕی مورە کوڕی زوهەلی شەیبانی دابەشی بکات. بۆ سەمامە کوڕی حەوەشبی شەیبانییش سەد هەزار درەمی نارد تا لەناو خەڵکەکەی ببیەخشێتەوە، بۆ جەعفەر کوڕی نافع و عوسمان کوڕی خەیبەری، هەرکام، بڕێك سامانی ڕەوانە کرد.

کاتێك شیعەکان سستی و ناتەوانی عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزیان بینی، چاوی تەماحیان تێبڕی و پێشنیاری فەرمانڕەوایەتی کردنی عەبدوالله کوڕی معاویەیان بەخەڵکاندا. لەمزگەوت کۆبوونەوە و هەراوهوریایان دروست کرد و ڕۆشتنە لای عەبدوالله کوڕی معاویەو ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر و بردیان کۆشك و ڕێگەیان نەدا عاسم کوڕی عومەر بڕواتە ناو کۆشك. ئەو ڕۆشتە لای براکەی لەحیرە. عەبدوالله کوڕی معاویە لەناو خەڵکانی کوفە دەرکەوت و بەیعەتیان لەگەڵ بەست: لەناو ئەوان: عومەر کوڕی غەزەبان، مەنسور کوڕی جمهور، ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله قەسری، برای خالید و کەسانیتر. ماوەیەك مایەوە و خەڵکان یەك لەدوای یەك بەیعەتیان لەگەڵ کرد. هەواڵی بەیعەتی خەڵکانی مەداینی پێگەیشت. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو، بۆ لای عەبدوالله کوڕی عومەر لەحیرە بەرێکەوت. بەکوڕی عومەریان وت: خەڵکان لەگەڵ معاویە، نزیك

کەوتونەتەوە. چەند ساتێك سەری خستەخوار. سەرپەرەستی نانکەرانی هات و وتی: نان، ئامادەیە. فەرمانیدا و نانی نیمەڕۆیان هێنا. خۆی و هاوەڵانی نانیان خوارد. نەدەترسا و خەڵکان چاوەڕوان بوون کوڕی عومەر هێرش بکاتە سەریان. لەنان خواردن تەواو بوو. سامانەکانی هێنایە دەر و لەناو فەرمانەدەکانی خۆی دابەشی کرد. دواتر کۆیلەیەکی بانگ کرد کەناوەکەی ئەمە بوو: مەیمون (پیرۆز) رەبیاح (ئاسوودەیی)، فەتح (سەرکەوتن) یا هەر ناوێکی خۆشی دیکە. ئاڵاکەی پێدا و وتی: ئەم ئاڵایە ببەرە فلان و فیسارە شوێن و لەسەر زەوی دایکووتە و هاوەڵانت بانگ بکە و بمێنەرەوە تا پەیوەستی تۆ دەبن. ئەو کارەی کرد.

عەبدوالله هاتەدەر و بینی زەوی لەهاوەڵانی عەبدوالله کوڕی معاویە سپی بووە. عەبدوالله کوڕی عومەر فەرمانی بەجارچییەکدا جاریدا: هەر کەس سەرێکی براو بێنێت، پێنسەد درەمی پێدەبەخشم. سەری زۆریان لای ئەو کەڵەکە کرد و ئەویش بەڵێنەکەی خۆی هێنایە دی.

پیاوێك لەخەڵکانی شام رووی کردە گۆڕەپان و قاسم کوڕی عەبد غەفاری عیجلی رووبەرووی بوویەوە. پیاوی شامی لەناو و نیشانی پرسی و قاسم پەلاماریدا. شامی وتی: گومانم نەدەکرد یەکێك لەپیاوەکانی بەکر کوڕی وایل، بۆ شەڕی من بێتەدەر. سوێند بەخوا مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ تۆم نییە بەڵام دەمەوێت داستانێکت بۆ بگێڕمەوە.: پێت دەڵێم کەهەموو ئەو کەسانەی لەخەڵکانی یەمەن و لەناو ئێوەدان، ئیسماعیل و مەنسور و کەسانی دیکە، نامەیان بۆ عەبدوالله کوڕی عومەر نووسیوە هەروەها خەڵکانی موزەریش. بەڵام ئەی خەڵکانی رەبیعە، نامە یا نێردراوی ئێوە نابینم. من پیاوێکم لەخەڵکانی قەیس. ئەگەر دەتانەوێت، نامە بنووسن تا بیگەیێنم و بەیانی رووبەرووی ئێوە ببمەوە چوونکە ئەمڕۆ شەڕتان لەگەڵ ناکەن. ئەم هەواڵە بەعەبدوالله کوڕی معاویە گەیشت. ئەویش، عومەر کوڕی غەزەبانی ئاگادار کردەوە. بۆچوونی عومەر کوڕی غەزەبان ئەوە بوو بەڵێن و بارمتە لە ئیسماعیل و مەنسور وەربگرێت، بەڵام عومەر ئەو کارەی نەکرد.

بەرەبەیان، خەڵکان هەستان وبۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد. عومەر کوڕی غەزەبان، هێرشی کردە سەر باڵی چەپی سوپاکەی عەبدوالله کوڕی عومەر کەپاشەکشێیان کرد. ئیسماعیل و مەنسور دەستبەجێ بۆ حیرە گەڕانەوە و هاوەڵانی عەبدوالله کوڕی معاویە بۆ کوفە هەڵاتن. کوڕی معاویە خۆی لەگەڵ ئەوان هەڵات و گەڕایەوە بۆ ناو کۆشکەکەی. ئەوانەی کە( لەموزەرییەکان و رەبیعە) لەباڵی چەپی سوپاکەی عەبدوالله کوڕی معاویەدا بوون، لەبەرابەر

شەڕكەرانی عەبدوالله كوڕی عومەر خۆڕاگریان كرد. ئەو بەعومەر كوڕی غەزەبانی وت: لەم كاری خەڵكەكەی ئێوە دڵنیا نەبووم، بگەڕێنەوە. كوڕی غەزەبان وتی: ناگەڕێمەوە تا دەكوژرێم. هاوەڵانی جڵەوی ماینكەی ئەویان گرت و بۆ ناو كوفەیان برد. كاتێك ئێواری داهات، عەبدوالله كوڕی معاویە پێی وتن: ئەی خەڵكانی رەبیعە، بینیتان خەڵكان چییان لەگەڵ كردین. ئێمە خوێنی خۆمان خستۆتە ملی ئێوە. ئەگەر شەڕ بكەن، شان بەشانی ئێوە شەڕ دەكەم و ئەگەر گومان دەكەن، خەڵكان هاوكاریمان ناكەن و بەتەنیا جێمان دەهێڵن، بۆ خۆتان وبۆ ئێمە ئەمان وەربگرن. عومەر كوڕی غەزەبان وتی: هاورێ لەگەڵ ئێوە شەڕ ناكەین و بۆ خۆمان و ئێوە، ئەمان وەرناگرین. لەكۆشكەكە مانەوە و خەڵكانی زەید، سەر كۆڵانەكانیان گرت و چەند رۆژێكیان بەشەڕ كردن لەگەڵ عەبدوالله كوڕی عومەر، بەسەر برد.

دواتر، خەڵكانی رەبیعە بۆ خۆیان وخەڵكانی زەید و عەبدوالله كوڕی معاویە، ئەمانیان وەرگرت تا بۆ هەر شوێنێك دەخوازن، بڕۆن.

عەبدوالله كوڕی معاویە لەكوفە هاتەدەرو لەمەداین نیشتەجێ بوو. خەڵكانێك لەكوفییەكان، سەردانیان كرد و لەگەڵ ئەوان بەرێكەوت و دەستی بەسەر حیلوان و كوێستانەكان و هەمەدان و نیسفەهان و رەیدا گرت. كۆیلەكانی خەڵكی كوفە رووبەروویان بوونەوە. ئەو شاعێرێكی بەناو بانگە. یەكێك لەهۆنراوەكانی بەمشێوەیە:

ولا تركبن الصنيع الذى　　　　تلوم اخاك على مثله

ولا يعجبنك قول امرىء　　　　يخالف ما قال فى فعله

یانی: ئەو كردەوەی رێگە نادەیت، براكەت، ئەنجامی بدات، ئەنجامی مەدە. ئاگادار بەوتاری كەسێك پەسەند نەكەیت كەوتەكانی و كردەوەكانی یەك ناگرێتەوە.

## گەڕانەوەی حارس كوڕی سورەیج بۆ مەرو

لەم ساڵەدا حارس كوڕی سوەریج بۆ مەرو گەڕایەوە. ئەو، بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ، لای ئاگرپەرستەكان مابوویەوە. پێشتر ئاماژەمان بەهۆكاری گەڕانەوەی ئەودا. لەجەمادی الثانی ساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی هاتە مەرو. خەڵك لەكەشمەهین، پێشوازیان لێكرد. كاتێك ئەوانی بینی، وتی: لەو كاتەوەی رۆشتووم، بەئەندازەی ئەمڕۆ، چاوەكانم رووناك نەبووە، رووناكی چاوی من تەنیا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كەخەڵكان، فەرمانەكانی خواوەند ئەنجام بدەن.

نەسر پێشوازی لێکرد و رۆژانەیەکی دیاریکراوی بۆ دەستنیشان کرد کەپەنجا درەم بوو. ئەو یەك رەنگی (لەخواردن و جل و بەرگ) هەڵدەبژارد و رەنگاورەنگی پەسەند نەدەکرد. نەسر، کەسان و بنەماڵەکەی ئەوی ئازاد کرد و پێشنیاری پێکرد تا فەرمانداری شارێکی پێ بسپێرێت و سەد هەزار دیناری پێ بدات. رازی نەبوو و پەیامی بۆ نەسر نارد: بەهیچ جۆرێك، خوازیاری ئەم جیهانە و خۆشییەکانی نیم، ئەوەی لەتۆم دەوێت، ئەوەیە بەپێی نووسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەر(د.خ)، هەڵس و کەوت بکەیت و چاکەکاران، وەك فەرماندار و فەرمانڕەوا دەستنیشان بکەیت. ئەگەر ئەم کارە بکەیت، لەبەرابەر دوژمنەکانت، پشتیوانیت لێ دەکەم.

حارس پەیامی بۆ کرمانی نارد: ئەگەر نەسر بڵێنم پێبدات بەپێی نووسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەر(د.خ)' دەجووڵێتەوە، پشتیوانی لێدەکەم و ئەگەر نەیکات و تۆ، ببیتە درێژەپێدەری شێوازی پێغەمبەر(د.خ)، پشتیوانی لەتۆ دەکەم. ئەو خەڵکانی تەمیمی لەخۆی نزیك کردەوە. دەستەیەك فراوان لەوان و کەسانیتر، وەلأمیان دایەوە و نزیکەی سێ هەزار کەس، لەدەوری کۆبوونەوە. بەنەسری وت: من سیانزەساڵ پێش، ئەم شارم بەجێهێشت و هۆکارەکەی، شەڕ کردن لەبەرابەر ستەمکاری بوو. ئێستا تۆ پێشنیاری ئەو کارەم پێدەکەیت؟!

## شۆڕشی خەڵکانی حمس

لەم ساڵەدا خەڵکانی حمس، شۆڕشیان دەستپێکرد.

چۆنیەتیەکەی: مەروان بۆ حەڕان گەڕایەوە و سێ مانگ، مایەوە. لەم کاتەدا خەڵکانی حمس، دژی ئەو، شۆڕشیان دەستپێکرد. ئەو کەسەی بۆ ئەم کارە هانیدان و پەیك و پەیامی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد، سابت کوڕی نوعەیم بوو. خەڵکانی حمس، بۆ دانیشتوانی تەدمور لەخەڵکانی کەلب، پەیامیان نارد و ئەسبەغ کوڕی زوالەی کەلبی و منالەکانی و معاویە سەکسەکی پەیوەستیان بوون. جگە لەم دووانە، کەسانی دیکەیش هاتن و ژمارەیان گەیشتە، سەد هەزار پیاوی شەڕکەر. ئەوان لەشەوی جەژنی رەمەزان/ ٦ ژوئیەی ٧٤٤ زایینی، گەیشتنە ئەو شارە. سلێمان کوڕی هوشام و ئیبراهیمی لەسەر کار لابراو، هاورێیەتی ئەوانیان دەکرد. پێشتر ئەمانی بەم دووانە بەخشیبوو و رێزی لێگرتبوون.. دوو رۆژ دوای جەژنی رەمەزان گەیشتە ئەوێ و بینی خەڵکان، دەروازەکانیان بەستوە. گەمارۆی خستە سەرشارەکەیان و

لەسەر یەکێك لەدەروازەکان، ئورودی لێدا. جارچییەکەی بەپاسەوانانی دەروازەکەی وت: بۆ پەیمانەکەتان شکاند؟ وتیان: گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆیین و پەیمانەکەمان نەشکاندوە. وتی: دەروازەکان بکەنەوە. دەروازەکانیان کردەوە و عومەر کوڕی وەزاح و خەڵکانی وەزاح ڕۆشتنە ناو شارەکە کەژمارەیان سێ هەزار شەڕکەر دەبوو. ئەو کەسانەی لەناو شارەکەدا بوون، ڕووبەڕوویان بوونەوە. شەڕیان لەگەڵ کردن بەڵام سوارەکانی مەروان لەژمارەدا فراوانتر بوون و دانیشتوانی شار، لەدەروازەی تەدمور، ڕۆشتنەدەرو شەڕکەران (هاوەڵانی مەروان) شەڕیان کرد و هەمووی ئەوانیان کوشت. ئەسبەغ کوڕی زواله و کوڕەکەی فەرافسە، گیانی خۆیان دەرباز کرد و مەروان دەستەیەکی فراوان لەئەسیرەکانی کوشت و پێنسەد کەس لەکوژراوانی بەدەوری شارەکەدا هەڵواسی و دیوارەکەی بەئەندازەی ڕۆشتنی تیرێك، خاپوور کرد.

دەستەیەك دەڵێن: گرتنی حمس لەساڵی ١٢٨/ ٧٤٥ زایینی ڕوویدا.

## نافەرمانی خەڵکانی غوتە

لەم ساڵەدا، خەڵکانی غوتە، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و یەزید کوڕی خالیدی قەسریان وەك ڕێبەری خۆیان هەڵبژارد و گەمارۆیان خستە سەر دیمەشق. فەرمانداری دیمەشق، زامل کوڕی عەمرۆ بوو. مەروان لەحمسەوە، باوکی وەرد کوڕی کەوسەر کوڕی زەفەر کوڕی حارس و عومەر کوڕی وەزاحی لەگەڵ دەهەزار شەڕکەر، بۆ هێرش کردنە سەر ئەوان، ڕەوانە کرد. کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتنەوە، هێرشیان کردە سەریان و خەڵکانی شار، بۆ شەڕ هاتنەدەر، بەڵام شکستیان خوارد و سوپاکەی مەروان، شار و لەشکرگەکەی ئەوانیان تاڵان کرد و مەزەیان سوتاند و گوندەکانی یەمەنییەکانیان لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد. یەزید کوڕی خالید، دیل کرا و کوژرا. زامول، سەری یەزیدی بۆ حمس نارد.

لەناو ئەو کەسانەی لەم شەڕەدا کوژران، یەکیان عومەر کوڕی هانی عەبسی بوو کەهاوکاری یەزیدی دەکرد. پیاوێکی خواپەرەست و لەرێگەی خوادا، دەجەنگا.

## نافەرمانی خەڵکانی فەلەستین

هەروەها لەم ساڵەدا، سابت کوڕی نوعەیم دوای خەڵکانی حمس و غوتە، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. نافەرمانی کردنی ئەو، پشتیوانی کردنی خەڵکانی فەلەستینی بەدواوە بوو.

ئەو لەبەرابەر مەروان خۆڕاگری کرد و رووی کردە تەبەرییە و گەمارۆی خستەسەر. فەرماندارەکەی، وەلید کوڕی معاویە کوڕی مەروان کوڕی حەکەم، برازای عەبدولمەلیك بوو. خەڵك، چەند رۆژێك شەڕیان لەگەڵ کرد.

مەروان کوڕی محەممەد نامەی بۆ باوکی وەرد نووسی و فەرمانی پێدا بۆ شەڕی ئەوان بەڕێکەوت. ئەو بەڕێکەوت و کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە، خەڵکانی تەبەرییە، دژی سابت راپەڕین و سوپاکەی ئەویان تالآن کرد. سابت، شکستی خوارد وبۆ فەلەستین گەڕایەوە. باوکی وەرد شوێنی کەوت و دووبارە، شەڕیان تاقیکردەوە. باوکی وەرد، جارێکی دیکە، شکستی پێهێنا و هاوەڵان و سوپاکەی تێکشکاند. سێ لەکوڕەکانی ئەسیر کران کەئەوانیان بۆ لای مەروان ڕەوانە کرد. کوڕەکەی، روفاعە، خۆی شاردەوە.

مەروان، رەماحس کوڕی عەبدولعەزیزی کەنانی وەك فەرمانداری فەلەستین دەستنیشان کرد کەتوانی سابت تێکبشکێنێت. دوای دوو مانگ، ئەوی گرت و زنجیر لەدەست وپێ، بۆ لای مەروان، ڕەوانەی کرد. فەرمانیدا و دەست و پێی هەر سێ منداڵەکەیان بڕییەوە و بۆ دیمەشقیان برد و لەمزگەوتی ئەوشارەدا، فڕێیاندان و دواتر لەدەروازەکانی دیمەشق، هەڵیانواسین.

مەروان لەدێر ئەییووب، ژیانی بەسەر دەبرد. بۆ دوو کوڕەکەی، عوبەیدالله کوڕی مەروان کوڕی محەممەد و عەبدوالله کوڕی مەروان کوڕی محەممەد، بەیعەتی لەخەڵکان وەرگرت و دوو کچەکەی هوشام کوڕی عەبدولەلیکی کردە هاوسەری ئەوان. بەمشێوەیە ئومەوییەکانی لەدەروی یەك کۆکردەوە. سەراسەری شام ملکەچی فەرمانەکانی بوو جگە لەتەدمور کەرێگەی نافەرمانیان گرتبووەبەر. ئەوان، کارێز و سەرچاوە و کانیاوەکانیان کوێر کردبوویەوە. ئەو، کەڵکی لەوشتر و مەشکە و دەفرەکان و ئاودانەکان وەرگرت. ئەبرەش کوڕی وەلید و سلێمان کوڕی هوشام و کەسانیتر، قسەیان لەگەڵ کرد و داوایان لێکرد، پێش دەسپێکردنی شەڕ لەگەڵ ئەو خەڵکە، پەیك و پەیامیان بۆ بنێرێت، مۆڵەتی ئەو کارەی پێدان. ئەبرەش ڕۆشتە لای خەڵکی ئەو دیارە و ئەوانی ترساند و ئاگاداری کردنەوە. ئەوان ملکەچی خۆیان نیشاندا و کەسانێك لەوان کە بەچاکەکاری مەروان، دڵخۆش بوون، بەرەو لای ئەو بەڕێکەوتن. ئەبرەش و فەرمانبەرەکانی، ڕۆشتنە لای مەروان و ئەمە دوای ئەوە بوو کەدیواری شارەکەیان وێران و خاپوور کرد.

مەروان، یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرەی لەپێش خۆیەوە، بۆ عێراق ڕەوانە کردبوو

تا شەڕ لەگەڵ زوحاکی خەواریجی بکات. لەناو خەڵکانی شام، دەستەیەکی وەك شاندی نوێنەرایەتی هەڵبژارد و فەرمانی پێدان، پەیوەستی یەزید بن. مەروان خۆی بەرەو روسافە بەڕێکەوت. سلێمان کوڕی هوشام مۆڵەتی وەرگرت بۆ ئەوەی چەند رۆژێك بمێنێتەوە و هاوەڵانی بەهێز ببن و شەکەتی و ڕەنجی شەڕ، لەجەستەیان بڕەوێتەوە. مەروان فەرمانی پێدا و خۆی بەرەو قرقیسیا بەڕێکەوت کەکوڕی هوبەیرە لەوێ بوو. مەروان دەیویست بۆ شەڕی زوحاکی خەواریجی ڕەوانەی بکات. دەهەزار کەس لەوانەی مەروان بۆ شەڕی زوحاك، ڕەوانەی کردبوون، گەڕانەوە و لەروسافە نیشتەجێ بوون. پێشنیاری نافەرمانی کردنی فەرمانەکانی مەروانیان بەسلێمان کرد. سلێمان رازی بوو.

## شۆڕشی سلێمان کوڕی عەبدولەلیك

لەبەرابەر مەروان کوڕی محەممەد

لەم ساڵەدا، سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولەلیك، ڕشتەی فەرمانبەری مەروان کوڕی محەممەدی لەملی خۆی فڕێدا و دژایەتی کردنی ئەوی دەستپێکرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کەئاماژەمان پیدا: سوپاییەکان پەیوەستی بوون و نافەرمانی کردنی مەروانیان پێ پێشنیار کرد و پێیان وت: تۆی لای خەڵکان، بۆخەلافەت، شیاوتریت. وەڵامی دانەوە و گرنگی بەوتەکانی ئەواندا و لەگەڵ موالی وبراکانی خۆی بەڕێکەوت و لەقینسرین ئوردوی لێدا و نامەی بۆ خەڵکانی شام نووسی. ئەوان لەهەر لایەکەوە، پەیوەستی بوون. مەروان ئاگادار بوویەوە و بۆ قرقیسیا گەڕایەوە و نامەی بۆ کوڕی هوبەیرە نووسی و فەرمانی پێدا لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە. مەروان لەگەڕانەوەدا، لای قەڵای (کامل) تێپەڕی کەدەستەیەك لەکەس و کاری سلێمان و مناڵەکانی هوشام، لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد. لەبەرابەر مەروان، لەقەڵاکەدا، سەنگەریان گرت و خۆیان داشارد. پەیامی بۆ ناردن: ئاگادارتان دەکەمەوە کەمترین زیان لەسوپاکەی من نەدەن، چوونکە ئەگەر ئەو کارە بکەن، چیتر لای من ئەمانتان نییە. وەڵامیان دایەوە: ئێمە خۆمان دەپارێزین. مەروان بەڕێکەوت و ئەوان هێرشیان کردە سەر کۆتایی سوپاکەی. ئەم هەواڵە بەمەروان گەیشت و ڕق و کینەی ئەوانی لەدڵ گرت.

نزیکەی حەفتا هەزار شەڕکەر لەخەڵکانی شام و زەکوان وکەسانیتر لەدەوری کۆبوونەوە. لەگوندی خوساف، لەپانتاییەکانی قینرسین، ئوردوی لێدا. مەروان لەکاتی گەیشتنی، هێرشی

کردە سەر و شەڕ دەستی پێکرد. سلێمان و سوپاکەی شکستیان خوارد و سوارەکانی مەروان شوێنیان کەوتن. دەیانکوشت و ئەسیریان دەگرت. لەشکرگەکەی ئەویان تالآن کرد. مەروان لەشوێنێك وەستا و دوو کوڕەکەی لەشوێنێکی دیکە و فەرماندەی پاسەوانەکانی لەشوێنێکیتر. فەرمانیدا، هەموو ئەسیرەکان سەر ببڕن جگە لەکۆیلەکان. لەو ڕۆژەدا زیاتر لەسی هەزار کەسیان کوشت. ئیبراهیم کوڕی سلێمان گەورەترین کوڕی سلێمان، کوژرا و خالید کوڕی هوشامی مەخزومی، خاڵی هوشامیش کوژرا. زۆربەی ئەسیرەکانی شەڕ، خۆیان وەك کۆیلە دەناساند. دەستی لەکوشتنی ئەوان هەڵگرت و فەرمانی پێدان، کۆیلەکان بەکەسێك بفرۆشن کەبەهای زیاتر بۆ کڕینی ئەوان تەرخان دەکات. هەر کەسێك ئەسیر دەکەن، بیکەن بەکۆیلە.

سلێمان بەرێکەوت تا گەیشتە حمس و ئەو کەسانەی لەگۆڕەپانی شەڕ، ڕزگاریان ببوو، پەیوەستی بوون. لەوێ خێوەتی هەڵدا و بوورج و دیواری شارەکەی سەر لەنوێ نۆژەن کردەوە پاش ئەوەی مەروان خاپووری کردبوو. مەروان بۆ تۆڵە سەندنەوە لەدانیشتوانی قەڵای کامل، هێرشی کردە سەریان. گەمارۆی خستە سەریان و لەسەر فەرمانی مەروان، هاتنەدەر. دەست و پێی و لووت و گوێچکەی ئەوانی بڕی. خەڵکانی ڕەقە، ئەوانیان تیمار کرد. دەستەیەکیان مرد و زۆربەیان زیندوو مانەوە. ژمارەیان سێسەد کەس دەبوو. دواتر ڕووی کردە سلێمان و هاوەڵانی. بەیەکیان وت: تاکەی لەمەروان شکست بخۆین؟ حەوتسەد کەس لەسوارەکانیان بۆ مەرگ، پەیمانیان بەست و بەرێکەوتن تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی بکەنەسەر و ئەگەر لەو کاتەدا بتوانن، مەروان بکوژن. مەروان، هەواڵی ئەم کارەی ئەوانی پێگەیست و ئامادەکاری پێویست و وشیاری گرتەبەر و بەشێوەیەکی ئاگا و وشیارانە، پێشڕەوی دەستپێکرد. سوارەکانی سلێمان نەیانتوانی بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی بکەنەسەر. لەبەر ئەمە لەسەر ڕێگەکەی دانیشتن و لەناو باخێکی زەیتون لەسەر ڕێگەکەی ئەو، خۆیان حەشاردا، کاتێك بەو پەڕی ئامادەییەوە، پێشڕەوی دەکرد، لەناکاو هێرشیان کردەسەر و شمشێریان خستە ناو سوپاکەی. سوپاکەی مەروان خۆڕاگریان کرد و سوارکارەکانیان پەیوەستیان بوون. لەکاتی هەڵاتن تا ئاوابوونی هەتاو، شەڕیان کرد. سوارەکانی سلێمان شکستیان خوارد و نزیکەی شەش هەزار کەس لەوان کوژرا.

کاتێك سلێمان لەشکستی ئەوان ئاگادار بوویەوە، سەعیدی برای وەك جێگری خۆی لەحمس دیاری کرد و خۆی بەرەو تەدمور بەرێکەوت و مایەوە. مەروان لەنزیکی حمس ئۆرودەی لێدا و گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی و هەشتا و چەند بەرد هاوێژی دانا کەشەو

و رۆژ، ئەوانیان بەردباران دەکرد. گەمارۆکە بۆ ماوەی دە مانگ بەردەوام بوو. خەڵکانی حمس ڕۆژانە دەهاتنەدەر و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر سووچ و کەنارەکانی سوپاکەی مەروان. کاتێك گرفتارییەکانی ئەوان فراوان بوو، داوای ئەمانیان کرد بەو مەرجەی دەستی مەروان بۆ سەر چەند کەسێك ئاوەڵا بکەن: سەعید کوڕی هوشام، دوو کوڕەکەی عوسمان کوڕی سەعید کوڕی هوشام، مەروان کوڕی سەعید، پیاوێك بەناوی سەکسەکی لەخەڵکانی حمس کەهێرشی دەکردە سەر سوپاکەی مەروان و پیاوێکی حەبەشی کەجوێنی بەمەروان دەدا. لەوتەکانی بەردەوام باسی کێری خۆی دەکرد و بەشوێنی خراپتری ژن (شەرمی ژن) و منداڵەکانی ئەو بەرابەری دەکرد. دەیوت: ئەی سلێمان، ئەی منداڵەکانی فلان و فلان، ئەمە ئالاکەی ئێوەیە. مەروان بەپێشنیاری خەڵکانی حمس رازی بوو. سەعید و دوو کوڕەکەی زیندانی کرد. پیاوی سەکسەکی کوشت و حەبەشی، تەسلیمی سلێمان کرد کەگوێچکە و لوت و کێری ئەویان بڕییەوە و لەت لەتیان کرد. کاتێك لەحمس تەواو بوو، بۆ شەڕی زوحاکی خەواریجی بەرێکەوت.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك سلێمان کوڕی هوشام لەخوساف، شکستی خوارد، هەڵات و ڕۆشتە عێراق بۆ لای عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز و لەگەڵ ئەو ڕۆشتەدەر و بەیعەتیان لەگەڵ زوحاك بەست و خەڵکیان دژی مەروان هاندەدا. یەکێك لەشاعیرەکان وتی:

الم تر ان الله اظهر دینه          و صلت قریش خلف بکر بن وائل

یانی: ئایا نەتبینی خوا سەرکەوتنی بەدینەکەی بەخشی؟ نەتبینی قورەیشییەکان چۆن لەپشت سەری بەکر کوڕی وایل، نوێژیان خوێند؟

کاتێك فەرمانداری تازەی عێراق، نەزر کوڕی سەعیدی حورەشی (دواتر ئاماژەی پێدەدەین) ئەمەی بینی، زانی ناتوانێت لەبەرابەر عەبدوالله کوڕی عومەر خۆڕاگری بکات. لەبەر ئەمە بۆ لای مەروان بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە قادسییە، کوڕی مەلجان، جێگری زوحاك، ڕووبەڕووی بوویەوە و نەزر شەڕی لەگەڵ کرد و زوحاك، موسەنا کوڕی عومەری عایدی وەك فەرمانداری عێراق دەستنیشان کرد.

زوحاك، لەمانگی زی قەعدە/ ئوتی ٧٤٥ زایینی بەرەو موسڵ بەرێکەوت و کوڕی هوبەیرە هات تا لەعەین تەمر دابەزی. موسەنا کوڕی عیمران بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بەرێکەوت و ئەم دووانە، چەندین رۆژ شەری یەکیان ئەزمون کرد. موسەنا و دەستەیەك لەفەرماندەکانی زوحاك، کوژران و خەواریج هەڵاتن. مەنسور کوڕی جمهور، هاوڕێیەتی

ئەوانی دەکرد. ئەوان ڕۆشتنە کوفە و کەسانی دیکەیان لەدەوری خۆیان کۆکردەوە و بۆ لای کوڕی هوبەیرە بەرێکەوتن و ڕوبەڕووی بوونەوە. چەندین ڕۆژ، شەڕیان کرد و دووبارە خەواریج، شکستیان خوارد. هوبەیرە هاتە ناو کوفە و لەوێوە بەرەو واست بەرێکەوت. کاتێك زوحاك بیستی چ بەڵایەك بەسەر سوپاکەی و هاوەڵانی، هاتووە، عوبەیدە کوڕی سواری تەغلەبی ڕەوانە کرد کە لەسەرات دابەزی. کوڕی هوبەیرە بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئەو گەڕایەوە و لەسەرات شەڕیان تاقیکردەوە.

## هاتنەدەری زوحاك و هەڵگرتنی دروشمی خەواریج

لەم ساڵەدا زوحاك کوڕی قەیسی خارجی هاتەدەر و دروشمی خەواریجی بەرز کردەوە. (فەرمانڕەوایی تایبەتە بەخوا). ڕۆشتە ناو کوفە.

چۆنیەتیەکەی: کاتێك وەلید کوژرا، پیاوێکی حەروری لەجەزیرە ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە کەپێیان دەوت سەعید کوڕی بەهدەلی شەیبانی. دوسەد کەس لەخەڵکانی جەزیرە پەیوەستی بوون. زوحاك یەکێك بوو لەوان. ئەو کوژرانی وەلید و گرفتاری مەروانی لەشام بەدەرفەت زانی و لەسەرزەمینی کفری توسا، شۆڕشی دەستپێکرد و بەستامی بەیهەسی کەباوەڕەکانی لەگەڵ ئەودا جیاواز بوو، بەهەمان دروشم، لەناو خەڵکانی ڕەبیعە، بزوتنەوەکەی خۆی دەستپێکرد. هەرکام لەوان بۆ لای ئەوەی دیکە بەرێکەوت. کاتێك لەیەك نزیك کەوتنەوە، سەعید، بەهدلی خەیبەری یەکێك لەفەرماندەکانی لەگەڵ سەد و پەنجا سوارکار ڕەوانە کرد. لەنائاگاییدا لێیان نزیك کەوتەوە. ئەوانی کوشتار و بەستام و هەموو هاوەڵانی، جگە لەچواردەکەسیان، کوژران. سەعید کوڕی بەدل بەرەو عێراق بەرێکەوت چوونکە بیستی لەوێ خەڵکان گرفتاری ناسازگارییە جۆراوجۆرەکان بوون. سەعید کوڕی بەهدل، لەرێگا مرد و زوحاك کوڕی قەیسیان وەك ڕێبەری خۆیان هەڵبژارد. شەرات (دەستەیەك لەخەواریج) بەیعەتیان لەگەڵ بەست و لەدەوری ئەو کۆبوونەوە بەشێوەیەك ژمارەی شەڕکەرانیان گەیشتە چوار هەزار کەس. زوحاك، هاورێ لەگەڵ ئەوان، بزوتنەوەکەی خۆی دەستپێکرد.

کاتێك وەلید لەناوچوو، کارگوزارەکەی لەعێراق، عەبدوڵڵە کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بوو و مەروان لەحیرە، ژیانی بەسەر دەبرد. مەروان بۆ نەزر کوڕی سەعیدی

حەرەشی، یەکێك لەفەرماندەکانی کوڕی عومەر، نامەی نووسی و ئەوی وەك فەرمانداری عێراق دەستنیشان کرد. کوڕی عومەر، فەرمانڕەوایەتی بەو نەسپارد. نەزر بەرەو کوفە بەرێکەوت و کوڕی عومەر، لەحیرە مایەوە. ئەم دووانە، چوارمانگ، شەڕیان لەگەڵ یەك کرد. مەروان، کوڕی غوزەیلی بۆ هاوکاری نەزر ڕەوانە کرد و موزەرییەکان (لەبەر خۆشەویستیان بۆ مەروان چوونکە داوای خوێنی وەلیدی دەکرد) لەدەوری نەزر کۆبوونەوە. دایکی وەلید قەیسی و لەخەڵکانی موزەر بوو. خەڵکانی یەمەن لەدەوری کوڕی عومەر کۆبوونەوە چوونکە لەکوشتنی وەلید، هاوکاری یەزیدیان کرد. ئەوان لەبەرژەوەندی کوڕی عومەر، شەڕیان دەکرد. هۆکاری ڕق و کینەیان لەوەلید، لەوێوە سەرچاوەی دەگرت کەئەو، خالیدی قەسری تەسلیم بەیوسف کوڕی عومەر کرد و سەری بڕی.

کاتێك زوحاك، لەناسازگاری ئەوان ئاگادار بوویەوە، رووی کردە ئەوان و مەبەستی هێرش کردنە سەر عێراقی کرد. ئەم رووداوە لەساڵی ١٢٧/ ٧٤٥ زایینی روویدا. کوڕی عومەر پەیامی بۆ نەزر نارد: ئەم پیاوە جگە لەمن و تۆ کەسی ناوێت. با لەزیانی ئەو، یەکبگرین. ئەم دووانە یەکیانگرت و لەکوفە کۆبوونەوە. هەرکام لەگەڵ هاوەڵانی خۆی نوێژی دەخوێند. زوحاك لەمانگی رەجەب/ ئاوریلی ٧٤٥ زایینی لەنوخەیلە، ئوردوی لێدا. ئەوان پێنج شەممە، بەیانی رۆژی دابەزینی خۆیان بۆ شەڕ دیاری و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. سوپاکەی کوڕی عومەر پاشەکشێی کرد و براکەی، عاسم کوڕی عەبدولعەزیز و جەعفەر کوڕی عەباسی کێندی برای عوبەیداللە کوڕی عەباسی کێندی، کوژران. کوڕی عومەر ڕۆشتە ناو سەنگەرەکەی خۆی و خەواریج تا شەو، دەوری ئەوانیان گرت. دواتر گەڕانەوە و رۆژی هەینی، شەڕیان دەستپێکردەوە. سوپاکەی کوڕی عومەر شکستی خوارد وبۆ ناو سەنگەرەکانی خۆیان گەڕانەوە. رۆژی شەممە، هاوەڵانی ئەو یەك یەك، خزانەدەر و بەرەو واست بەرێکەوتن. خەڵکانێکیان بینی کەهیچ کات شەرکەرانی بەهێزتر و تێکۆشەرتر لەوانیان نەبینیبوو.

دەستەیەك لەخەڵکان لەواست نیشتەجێ بوون. نەزر کوڕی سەعیدی حورەشی و ئیسماعیل کوڕی عەبدوڵڵە قەسری برای خالید کوڕی عەبدوڵڵە و مەنسور کوڕی جمهور و ئەسبەغ کوڕی زوالە و کەسانیتر لەگەورەکان، هاورێیەتیان دەکرد. کوڕی عومەر لەگەڵ ئەو دەستە لەهاوەڵانی کەمابوونەوە، دانیشت و لەشوێنەکەی نەجووڵا. یەکێك لەهاوەڵانی پێی وت: خەڵك هەڵاتن، بۆ ماویتەوە؟ ئەو دوو رۆژی دیکە مایەوە و جگە لەهەڵاتنی سوپاکەی،

هیچی دیکەی نەبینی. لەم کاتەدا بۆ واست کۆچی کرد و زوحاك دەستی بەسەر کوفەدا گرت و ڕۆشتە ناو شارەکە. عوبەیدالله کوڕی عەباسی کێندی لەوە دەترسا، زوحاك بیکوژێت. لەبەر ئەمە ڕۆشتە لای زوحاك و بەیعەتی لەگەڵ بەست و بوو بەیەکێك لەشەڕکەرانی ئەو. باوکی عەتای سەندی ئەم هۆنراوەی بۆ ئەو نووسی:

| | |
|---|---|
| فقل لعبیدالله لو کان جعفر | هو الحی لم یجنح و انت قتیل |
| و لم یتبع المراق و الثار فیهم | و فی کفه غضب الذباب صقیل |
| الی معشر اودوا اخاك و اکفروا | اباك فماذا بعد ذاك تقول |

یانی: بەعوبەیدالله بڵێ، ئەگەر جەعفەر زیندوو دەبوو، پێش ئەوەی شەو دابێت، دەکوژراییت. لەدین هەڵگەڕاوەکان کەخوێنیان لەگەردندا بوو، بەرێگەی خۆیاندا نەدەڕۆشتن چوونکە ئەو شمشێرێکی تیژ و ئاوداری لەدەستا بوو و ڕێگەی لەوان دەبەست. ڕووت کردە خەڵکانێك براکەتیان کوشت و باوکی تۆیان بەناباوەڕ لەقەڵەمدا. دوای ئەمە، دەتوانی چی بڵێیت؟

کاتێك ئەم هۆنراوەی باوکی عەتا بەگوێی عوبەیدالله گەیشت، وتی: خوا کارێك بکات، گاز لەقیتکەی قوزی دایکت بگرێت:

| | |
|---|---|
| فلا وصلتك الرحم من ذی قرابة | و طالب وتر و الذلیل ذلیل |
| ترکت ابا شیبان یسلب بزه | و نجاك خوار العنان مطول |

یانی: پەیوەندییەکەت بەهێز نەبێت چوونکە خزمێك و تۆڵەستێنێکی ریسواییت و لەریسوا، تەنیا ریسوا، لەدایك دەبێت. برای شەیبانت پشتگوێ خست کەجلەکانی داکەنن و ئەسپێکی خاو و خلیچك، کردەوەکانی تۆ رزگار بکات.

کوڕی عومەر گەیشتە واست و لەماڵی حەجاج کوڕی یوسف مایەوە و شەڕی نێوان عەبدوالله و نەزر بۆ شێوازی پێش هێرشی زوحاك بۆ سەر نەزر، گەڕایەوە. نەزر خوازیاری ئەوە بوو کوڕی عومەر فەرمانڕەوایەتی عێراقی پێ بسپێرێت و کوڕی عومەر، رازی نەدەبوو. زوحاك لەکوفەوە بەرەو واست کەوتە ڕێ و مەلجانی شەیبانی وەك جێگری خۆی لەکوفە، بەجێهێشت. زوحاك لەدەروازەی مزمار دابەزی.

کاتێك کوڕی عومەر و نەزر ئەمەیان بینی، شەڕی نێوان خۆیان پشتگوێ خست و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی زوحاك، پەیمانیان بەست. لەمانگەکانی شەعبان و ڕەمەزان و شوال/ مەی و ژوئەن و ژوئیە ٧٤٥ زایینی، بەردەوام ئاگری شەڕ لەنێوان ئەواندا، هەڵگیرساوبوو.

مەنسور کوڕی جمهور بەعەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی وت: من هاوشێوەی ئەم خەڵکانەم نەبینیوە! بۆ شەڕیان لەگەڵ دەکەیت و ڕێگەی شەڕ لەمەروانیان لێدەگریت؟ دڵی ئەوان بەدەست بێنە و بیانکەرە قەڵغانی خۆت لەنێوان خۆت و مەروان چوونکە بەمشێوەیە دەست لەشەڕ کردن لەگەڵ ئێمە هەڵدەگرن و زیانەکانی سەر مەروان قورستر و دژوارتر دەکەن. ئەگەر بەسەر ئەودا زاڵ ببن، ئەوەیە تۆ دەخوازیت و لەم کاتەدا بەشێوەیەکی ئاسوودە ژیان بەسەر دەبەیت و ئەگەر مەروان بەسەر ئەواندا زاڵ بێت و تۆ مەبەستی شەڕ لەگەڵ ئەو بکەیت، کاتێك بەتەواوی حەساوەیت و ئاسوودە و سوپاکەی مەروان شەکەت و ماندوو و بێزارن، شەڕ دەستپێدەکەیت. کوڕی عومەر وتی: پەلە مەکە با بزانم دەبێت چی بکەین. مەنسور پەیوەستی ئەوان بوو و وتی: دەمەوێت باوەڕ بەئیسلام بێنم و وتەکانی خواوەند ببیستم. ڕۆشتە ناو ئەوان و بەیعەتی لەگەڵ کردن.

دواتر عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەشوال/ ژوئیەی ٧٤٥ زایینی، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان مۆر کرد و دەستی بەیعەتی خستە ناو دەستی زوحاك. سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولەلیك، لەگەڵ ئەودا بوو.

## لەسەر کار لابردنی باوکی خەتار لەفەرمانڕەوایەتی کردنی ئاندۆلۆس

**فەرمانڕەوایەتی سەوابە**

لەم ساڵەدا، خەڵکانی ئاندۆلۆس، باوکی خەتار حسام کوڕی زەرار، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆسیان لەسەر کار لابرد.

هۆکارەکەی: کاتێك باوکی خەتار ڕۆشتە ئاندۆلۆس، هاوڕێیەتیەکی کوێرکوێرانەی بۆ یەمانییەکان لەخۆی نیشاندا و دوژمنایەتی بەرابەر بەموزەرییەکان کرد. ڕۆژێك پیاوێك لەکەنانە لەگەڵ پیاوێکی غەسانی مشتومڕی دەکرد. کەنانی داوای لەهاوڕێکەی خۆی، سەمیل کوڕی حاتەم کوڕی زی جەوشنی زەبابی کرد، هاوکاری بکات. لەم بارەوە لەگەڵ باوکی خەتار قسەی کرد. باوکی خەتار بەشێوەیەکی ناپەسەند و توند و تیژ قسەی لەگەڵ کرد و سەمیل وەڵامی دایەوە. فەرمانیدا بەپێوە بیوەستێنن و شەقەزللە لەپشتە ملی بدەن، دەستارەکەی خواربوو. کاتێك ڕۆشتەدەر، وتی: بەم زوانە دەستارەکەی تۆیش، خوار دەبێت. وتی: ئەگەر، کەسەکانم لەدەورم بن، دەستارەکەم بۆ ڕاست دەکەنەوە.

سەمیل یەکێك لەگەورەکانی موزەر بوو. کاتێك لەگەڵ هۆزی بەلج ڕۆشتە ئاندۆلۆس،

شانازی بەخۆیەوە کرد و سەروەری پێبڕا. کاتێك ئەم داستانە روویدا، خەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە و بۆی باس کردن. وتیان: گوێرایەڵی فەرمانەکانی تۆین. وتی: دەمەوێت باوکی خەتار لەئاندۆلۆس دەرپەڕێنم. یەکێك لەهاوەڵانی وتی: ئەو کارە بکە و دەستی هاوکاری بۆ هەموو هاوریکانت درێژ بکە بەڵام داوای هاریکاری باوکی عەتای قەیسی مەکە. ئەو یەکێك بوو لەگەورەکانی قەیس و لەسەر رێبەرایەتی کردنی قەیس، دژایەتی سەمیلی دەکرد. کەسانیتر وتیان: بۆچوونی راست ئەوەیە بڕۆیتە لای باوکی عەتا و راوێژی لەگەڵ بکەیت چوونکە هەست و سۆزی دەرونی، دەیبزوێنێت و هاوکاریت دەکات. ئەگەر، گرنگی پێنەدەیت، پەیوەستی باوکی خەتار دەبێت و لەزیانی تۆ، هاوکاری ئەو دەکات. هەروەها کارێکی پەسەندە ئەگەر جیاواز لەخەڵکانی مەعدن لەخەڵکانی یەمەنیش، داوای هاوکاری بکەیت.

ئەو کارەی کرد و هەمان شەو سەردانی باوکی عەتای کرد. باوکی عەتا دانیشتووی شاری ئەستجە بوو. رێزی لەسەمیل گرت و لەهۆکاری هاتنەکەی پرسی. سەمیل ئاگاداری کردەوە. هیچی لەگەڵ نەوت تا هەستا و سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و جل و بەرگی شەڕی پۆشی و شمشێری بەدەستەوە گرت و وتی: هەر ئێستا هەستە و بەرێکەوە و بۆ کوێ دەخوازیت، بڕۆ چوونکە هاورێیەتی تۆ دەکەم. فەرمانی بەکەسان و هاوەڵانیدا، فەرمانەکانی ئەنجام بدەن. بەرەو مەرو بەرێکەوتن. فەرماندارەکەی، سوابە کوڕی سەلامەی حەدانی بوو. خەڵکان گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون. باوکی خەتار ئەوی کردبووە فەرمانڕەوای سودیل و شوێنەکانی دیکە. دواتر لەسەر کار لایبرد و بووە هۆی ئەوەی رق و کینەی باوکی خەتار لەدڵیدا سەوز ببێت. سەمیل داوای هاوکاری لێکرد و بەڵێنی پێدا کاتێك باوکی خەتار دەرپەڕێنن، ئەو وەك فەرمانڕەوا هەڵبژێرن. سەوابە، وەڵامی دانەوە و بەڵێنی هاوکاری پێدان. داوای هاوکاری لەخەڵکەکەی کرد و ئەوانیش وەڵامیان دانەوە و هەموویان بەرەو شەدوونە بەرێکەوتن.

باوکی خەتار، لەقەرتەبەوە رووبەروویان بوویەوە و پیاوێکی وەك جێگری خۆی دیاریکرد. هەردوو سوپا، رووبەرووی یەك بوونەوە و لەمانگی رەجەب/ ئاوریلی ٧٤٥ زایینی، شەڕیان دەستپێکرد. بەسەختی شەڕیان کرد وسەرئەنجام، باوکی خەتار و سوپاکەی شکستیان خوارد و هاوەڵانی بەشێوەیەکی مەترسیدار کوشتار و خۆی ئەسیر کرا. لەقەرتەبە، ئومەییە کوڕی عەبدولمەلیك، جێگرەکەی باوکی خەتاری دەرپەڕاند و سامانەکانی ئەم دووانەی تالان کرد.

کاتێك باوکی خەتار شکستی خوارد، سەمیل و سەوابە کوڕی سەلامە ڕۆشتنە ناو قەرتەبە و دەستیان بەسەردا گرت. سوابە فەرمانداری گرتەدەست بەڵام زۆری نەخایاند عەبدولرەحمان کوڕی حەسانی کەلبی دژی ئەو راپەڕی و باوکی خەتاری لەزیندان هێنایەدەر. یەمانییەکان کەوتنە جۆش و دەستەیەکی فراوان، دەوری ئەویان گرت. هاورێ لەگەڵ ئەوان، رووی لەقەرتەبە کرد. سوابە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەیەمانییەکان و موزەرییەکان، لەگەڵ سەمیل، رووبەرووی بوونەوە. کاتێك دوو دەستەی نەیار، شەڕیان دەستپێکرد، پیاوێك لەموزەرییەکان هاواری کرد: ئەی خەڵکانی یەمانی! ئێمە کەسێك لەئێوەمان کردە فەرماندار، بۆ لەبەر باوکی خەتار، شەڕی ئێمە دەکەن؟ (مەبەستی سوابە یەمەنی بوو)). ئەگەر فەرماندار لەئێمە دەبوو، بیانوی پێویستتان دەستدەکەوت بۆ ئەوەی شەڕی ئێمەی پێبکەن. ئێمە بۆیە ئەم قسانە دەهێنیتە سەرزمان، چوونکە دەمانەوێت، ڕێگە لەکوشتار و خوێنرێژی بگرین و ئاسوودەی کۆمەڵانی خەڵك بەدەست بێنین. کاتێك خەڵك وتەکانی ئەویان بیست، وتیان: سوێند بەخوا راست دەکات. فەرماندار لەئێمەیە، بۆ دەبێت لەگەڵ خەڵکەکەی خۆمان بجەنگین؟ شەڕیان پشتگوێ خست و خەڵکان بڵاوەیان لێکرد. باوکی خەتار هەڵات و پەیوەستی باجە بوو. سوابە بۆ قەرتەبە گەڕایەوە. لەبەر ئەمە، ئەم سوپایان بە ((سوپای ئاسایش) ناو برد.

## شوێنکەوتەکانی بەنی عەباس

لەم ساڵەدا، سلێمان کوڕی کەسیر و لاهیز کوڕی قورەیز و قەحتەبە، بەرەو مەککە بەڕێکەوتن و لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی محەممەدی ڕێبەر، لەم شارەدا کۆبوونەوە و بیست هەزار درەم و دوسەد هەزار دینار و کاڵای فراوانیان بەیەکێك لەکۆیلەکانی ئەودا. ئەبوو موسلیم لەگەڵ ئەواندا بوو و سلێمان بەئیبراهیمی وت: ئەمە کۆیلەی تۆیە.

هەروەها لەم ساڵەدا بووکەیر کوڕی ماهان، نامەی بۆ ئیبراهیم نووسی کە لەسەرەمەرگدایە و باوکی سەلە حەفص کوڕی سلێمانی وەك جێگری خۆی دیاریکردووە و ئەو پەسەند کراوی ڕێبەرە. ئیبراهیم نامەی بۆ باوکی سەلە نووسی و فەرمانی پێدا سەرپەرەستی کاروباری شوێنکەوتەکانی ئەو لەدەست بگرێت. هەروەها نامەی بۆ خەڵکانی خوراسان نووسی و ئاگاداری کردنەوە کاروباری ئەوانی بەباوکی سەلە سپاردووە. باوکی سەلە بەرەو خوراسان بەڕێکەوت. خوراسانییەکان ئەویان بەراستگۆ زانی و پێی رازی بوون.

هەرچی سامانی شوێنکەوتەکانی بەنی عەباس لای ئەوان کۆببوویەوە، لەگەڵ پێنج یەکی سامانەکانی خۆیانیان تەسلیم کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

عەبدولعەزیز کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ئاینی حەجی لەم ساڵەدا لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو، فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف بوو. فەرمانڕەوای عێراق، نەزر کوڕی حەبەشی و لەخوراسان نەسر کوڕی سەیار فەرمانڕەوایەتی دەکرد. لەم ناوچەیە کەسانێکی وەك کرمانی و حارس کوڕی سورەیج، دژایەتیان لەگەڵدا دەکرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: سوەید کوڕی غەفەلە کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٢/ ٧٥٠ زایینی و لەتەمەنی ١٢٠ ساڵی چاوی لەجیهان بەست، عەبدولکەریم کوڕی مالکی جەزری کەئامازەیان بەساڵی جیاوازی دیکە داوە. باوکی حوسەین عوسمان کوڕی حوسەینی ئەسەدی کوفی، باوکی ئیسحاق عەمرۆ کوڕی عەبدوڵلەی سەبیعی هەمەدانی کەدەڵێن:

لەساڵی ١٢٨/ ٧٦٤ زایینی و لەتەمەنی سەد ساڵی، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. عەبدواللە کوڕی دینار کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٦/ ٧٥٤ زایینی، مرد. محەممەد کوڕی واسعی ئەزدی بەسری ناسراو بەنازناوی ئەبووبەکر، داوود کوڕی ئەبی هند (ناوی ئەبوو هند دینار موالی بەنی قوشەیر ئەبوو محەممەد)، باوکی بەحر عەبدواللە کوڕی ئیسحاق موالی خزر لەگەورەکان و زاناکانی وشەناسی و شارەزایی ڕێزمانی عەرەبی بوو. زانستەکەی خۆی لەیەحیا کوڕی نەعمان فێر ببوو و بەردەوام ڕەخنەی لەفەرزدق دەگرت و دەیوت ناڕاست و ناخۆش دەنووسێت. فەرزدق ئەوی سەرکۆنە کرد و وتی:

فلو كان عبدالله مولى هجوته و لكن عبدالله مولى مواليا

یانی: ئەگەر عەبدواللە کۆیلەی پیاوێکی نیوە عەرەب بوو، ئەگەری هەیە زمانم بۆ ئیهانە کردنی ئەو بکردایێتەوە. بەڵام عەبدواللە کۆیلەی کۆیلەکانە.

باوکی عەبدواللە پێی وت: دووبارە ناڕاست شتت نووسی کەوتت (مواليا) دەبێت بڵێیت: ((مولى موال)

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و هەشتی کۆچی (( ٧٤٥ – ٧٤٦ زایینی ))

### کوژرانی حارس کوڕی سورەیج و زاڵبوونی کرمانی لەمەرو

پێشتر ئاماژەمان پێدا یەزید کوڕی وەلید، ئەمانی بەحارس کوڕی سورەیج بەخشی و حارس لەوڵاتی بتپەرستەکان گەڕایەوە و دواتر لەنێوان ئەو و نەسر کوڕی سەیار، ناسازگاری کەوتەوە.

کاتێك کوڕی هوبەیرە بوو بەفەرمانڕەوای عێراق، نامەی بۆ نەسر کوڕی سەیار نووسی و فەرمانڕەوایەتی ئەوی لەخوراسان پشتڕاست و بەهێز کردەوە. ئەو بۆ مەروان کوڕی محەممەد بەیعەتی لەخەڵك وەرگرت. حارس وتی: یەزید ئەمانی بەمن بەخشیوە نەك مەروان کوڕی محەممەد، مەروان گرنگی بەئەمانەکەی وەلید نادات و من لەو ئاسوودە نابم. ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ نەسری گرتەبەر. نەسر پەیامی بۆ نارد و پێشنیاری بەیعەت و هاودەنگی لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکی پێکرد و لەدوو بەرەکی و ئاژاوەنانەوە ئاگاداری کردەوە و فەرمانی پێدا دەست لەکارە نەشیاوەکانی خۆی هەڵبگرێت. حارس نەیبیست و گرنگی بەوتەکانی نەدا و بەرێکەوت و نوردوی لێدا و پەیامی بۆ نەسر نارد کەفەرمانڕوایی بەراوێژکردن (یا شەوڕا) بسپێرە. نەسر ڕازی نەبوو و حارس، فەرمانی بەجەهم کوڕی سەفوان سەرکردەی جەهمییەکاندا (موالی راسب) شێواز و کردەوەکانی ئەو و پێشنیارەکانی بەخەڵکان رابگەیێنێت و ئاگاداریان بکاتەوە. کاتێك پێشنیارەکانی ئەویان بیست، کەڵەکە بوون و لەدەوری ئەو کۆبوونەوە. حارس کەسی بۆ لای نەسر ڕەوانە و فەرمانی پێدا سالم کوڕی ئەحوەزی فەرماندەی پاسەوانەکانی لەسەر کار لاببات و لەجیاتی کارگوزارەکانی ئێستای، کارگوزاری دیکە دەستنیشان بکات و بەم شێوەیە سامان بەکارەکان بدەن کەکەسانێك هەڵبژێرن و لەناو ئەوان کەسانێك دیاری بکەن و بەپێی نووسراوی خواوەند، بجوڵێنەوە. نەسر، موقاتیل کوڕی سلێمان و موقاتیل کوڕی جەهمی هەڵبژارد و حارس، موغیرە کوڕی شوعبەی جەهزەمی و موعاز کوڕی جەبەلە. نەسر فەرمانی بەدەبیرەکەی خۆیدا ئەوەی ئەم چوار کەسە لەکردەوە ئیسلامییەکان پەسەندی دەکەن، بنووسێت و ئەوان بکاتە فەرماندەی سنوورەکانی سەمەرقەند و تەخارستان. حارس وای نیشاندەدا کەخاوەنی ئاڵا ڕەشەکانە. نەسر پەیامی بۆ نارد: ئەگەر گومان دەکەیت ئەو کەسەیت کەدیواری دیمەشق وێران دەکەیت

و فەرمانڕەوایی ئومەوییەکان دەڕوخێنێت، پێنسەد سەر و دووسەد وشتر لەمن وەربگرە و ئەوی پێداویستی و کەل و پەلی شەڕ، کەپێویستە، هەڵبگرە و بەرێکەوە چوونکە بەگیانی خۆم سوێند، ئەگەر تۆ خاوەنی ئەم کارە بیت، من دەستپەروەردەی تۆم و ئەگەر نیت، بێ گومان کەسەکان و بنەماڵە و هاورێیانی خۆت بەرەو مەرگ دەبەیت.

حارس وتی: بەباشی دەزانم ئەم ڕێگەیە ڕاست و دروستە بەڵام هاورێکانم بۆ ئەم کارە بەیعەت لەگەڵ من ناکەن. نەسر وتی: ئێستا دەرکەوت ئەوان لەگەڵ تۆدا نین. لەخوا بترسە چوونکە بیست هەزار کەس لەخەڵکانی ڕەبیع و یەمەن لەناو دەبەیت. نەسر پێشنیاری پێکرد بەفەرمانڕەوایی کردنی ماوەرائەلنەهر ڕازی ببێت و سێسەد هەزار دردمی لێ وەربگرێت. حارس ڕازی نەبوو. نەسر وتی: لەکرمانییەوە دەست پێبکە چوونکە ئەگەر بیکوژیت، من فەرمانبەری تۆ دەبم. ڕازی نەبوو.

ئەوسا ئەم دووانە بەوە ڕازی بوون جەهم کوڕی سەفوان و موقاتیل کوڕی حەییان لەنێوان خۆیان بکەنە داوەر. بەمشێوەیە داوەریان کرد کەنەسر خۆی لەفەرمانڕەوایەتی بەدوور بگرێت و چارەنووسی فەرمانڕەوا بەئەنجومەنی ڕاوێژ کردن بسپێرێت. نەسر ڕازی نەبوو و حارس ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر. نەسر درۆی بەدەم دەستەیەک لەهاوەڵانی خۆیەوە هەڵبەست کەنامەیان بۆ حارس نووسیوە. ئەوان داوای لێخۆشبوونیان کرد و نەسر لێیان خۆشبوو.

لەم کاتەدا، دەستەیەک لەخەڵکانی خوراسان کەبۆنی ئاژاوەیان کردبوو، ڕۆشتنە لای: ئەم کەسانە لەناو ئەواندا دەبینران: عاسم کوڕی عومەیری سورەیمی، باوکی زەیبالی ناجی، موسلیم کوڕی عەبدولرەحمان وکەسانیتر. حارس فەرمانیدا شێوەی هەڵس و کەوت و باوەڕ و بۆچوونەکانی ئەو لەناو بازار و مزگەوت و لەماڵی نەسر، بۆ خەڵکان باس بکەن. باسیان کرد و دەستەیەکی فراوان لەدەوری حارس کۆبوونەوە. پیاوێك لەبەردەم ماڵی نەسردا ئەو کارەی کرد. کۆیلەکانی نەسر لێیاندا. حارس شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و دەستی بەخۆ ئامادە کردن کرد. پیاوێك لەمەرو، ڕێگەی ژێرزەمینی دەرگای دیواری مەروی نیشانی حارسدا. حارس بەرێکەوت و هەڵیکۆڵی و لەدەروازەی بالینەوە ڕۆشتە ناو شارەکە. جەهم کوڕی مەسعودی ناجی ڕووبەرووی ئەوان بوویەوە و کوژرا و خەڵك، ماڵی سالم کوڕی ئەحوەزیان تاڵان و پاسەوانەکانی دەروازەی بالینیان کوشت. ئەم ڕووداوە لەرۆژی دووشەممە دوو ڕۆژ بۆ کۆتایی جەمادی الثانی/ ٢٦ مارسی ٧٤٦ زایینی ڕوویدا. حارس بەکۆڵانی سەعددا گەڕا و ئەعیەن،

کۆیلەی حەییانی راویە، شەڕی لەگەڵ کرد کەدواهاتەکەی بەکوشتنی ئەعیەن کۆتایی هات.

کاتێك بەرەبەیان بوویەوە، سالم سوار بوو و جاڕچییەك، جاڕیدا: هەرکەس یەك سەر بێنێت، سێسەد دردەمی پێدەبەخشن. هەتاو هەڵنەهات کەحارس شکستی خوارد و بۆ ماوەی شەو و رۆژێك شەڕی لەگەڵ کردن. سالم ڕۆشتە ناو سوپاکەی حارس و دەبیرەکەی ئەوی کوشت. ناوی یەزید کوڕی داوود بوو. هەروەها ئەو پیاوەی کوشت کەرێگەی ژێرزەمینی نیشاندابوون.

نەسر کەسی بۆ لای کرمانی نارد. پیاوەکە ڕۆشتە لای و کەسانێك لای کرمانی دانیشتبوون. لەنێوان سالم کوڕی ئەحوەز و میقدام کوڕی نوعەیم، دەمەقاڵەیەك روویدا و هەرکام بەشێوەیەکی ناشیرین لەگەڵ ئەوی دیکە، قسەی کرد. بەهاوکاری هەرکام لەم دووانە، چەند کەسێك لەئامادە بووان هەستانە سەرپێ. کرمانی ترسا لەوەی ئەمە فێڵێك لەلایەن نەسرەوە بێت. هەستا و ئەوان پەلاماریاندا بەلاّم دانەنیشت و سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و گەڕایەوە، وتی: نەسر دەیویست فێڵ لەمن و دەستی بەخوێنم سوور بکات.

لەو رۆژەدا جەهم کوڕی سەفوان کەهاورێی کرمانی بوو، کوژرا. حارس کوڕەکەی حاتەم کوڕی حارسی بۆ لای کرمانی نارد کەمحەممەد کوڕی موسەنا پێی وت: ئەم دووانە، دوژمنی تۆن، رێگەبدە شەڕی یەك بکەن و بەیەکترەوە سەرقاڵ بن. بۆ بەیانی، کرمانی سوار بوو و ڕۆشتە دەروازەی گۆڕەپانەکەی یەزید و لەگەڵ سوپاکەی نەسر، شەڕی کرد. ئەو هێرشی کردە سەر دەروازەی حەرب کوڕی عامر و سوپاکەی خۆی لەرۆژی چوارشەممە بۆ شەڕی نەسر نارد کەیەکتریان تیرباران کرد و دواتر لەیەك جیابوونەوە. رۆژی پێنجشەممە، شەڕ روویندا. رۆژی هەینی رووبەرووی یەك بوونەوە و ئەزدییەکان پاشەکشێیان کرد تا گەیشتنە کرمانی. ئەو ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و شەڕی کرد. هاوەڵانی نەسر شکستیان خوارد و ئەمان، هەشتا ئەسپیان لەوان گرت و تەمیم کوڕی نەسر کەوتە سەرزەوی و ماییەکەیان گرت. سالم کوڕی ئەحوزە کەوتە سەرزەوی و ئەوویان بۆ لەشکرگەکەی نەسر برد. دوای تێپەڕینی ماوەیەك لەشەو، نەسر لەگەڵ عەسمە کوڕی عەبدوالله ئەسەدی، لەمەرو ڕۆشتەدەر. ئەو پشتیوانی لەنەسرییەکان دەکرد. سێ رۆژ شەڕیان کرد کە لەکۆتاییدا، هاوەڵانی کرمانی (ئەزدییەکان و خەڵکی رەبیعە) شکستیان خوارد و خەلیل کوڕی غەزوان هاواری کرد: ئەی خەڵکی یەمەن، ئەی خەڵکی رەبیعە، حارس هاتۆتە ناو بازار و زادەی پیاوی دەستبڕاو (نەسر کوڕی سەیاری) کوشتووە. موزەرییەکان شڵەژان چوونکە پشتیوانیان

لەنەسر دەکرد. شکستیان خوارد و تەمیم کوڕی نەسر دابەزی و جەنگا.

کاتێك یەمانییەکان، موزەرییەکانیان شکستدا، حارس پەیامی بۆ نەسر نارد: خەڵکانی یەمەن، بۆهەڵاتنی ئێوە سەرکۆنەم دەکەن. من دەست لەشەڕ هەڵدەگرم، پیاوە بەهێزەکانی سوپاکەت، بۆ رووبەروو بوونەوەی کرمانی ڕەوانە بکە. نەسر لەمبارەوە پەیمان و سوێندی لێوەرگرت. لەم کاتەدا عەبدحەکیم کوڕی سەعدی عەوەزی و باوکی جەعفەر عیسا کوڕی جەزری مەککی، لەمەککەوە هاتنە لای نەسر. نەسر بەعەبدحەکیم عەوزەی (تیرەیەك لەئەزدییەکان) وت: ئایا کارە نەشیاو و نەزانانەکانی خەڵکەکەت نابینی؟ وتی: بەڵێ، خەڵکە نەزانەکەت، زۆرداریان بەفەرمانڕەوایەتی تۆ، درێژەی کێشاوە، هەموو کاروبارەکان کەوتۆتە دەستی تۆ، نەك خەڵکانی رەبیعە و یەمەن. ئەوان لەخۆشیدا خەریکە دەتەقن. لەناو خەڵکانی یەمەن و رەبیعە، بیرمەندان و نەزانەکان دەژین، بەڵام نەزانەکان بەسەر بیرمەندەکاندا زاڵبوون. باوکی جەعفەر عیسا بەنەسری وت: ئەی فەرماندار، بەم هەموو گرفتارییەوە، فەرمانڕەوایەتی بەسە، کارێکی گەورە رووی لەتۆ کردووە، بەم زوانە پیاوێکی بێ ناو و نیشان دێت و ئاڵا و جلی ڕەش بەرز دەکاتەوە و پێشنیاری دەوڵەتێك دەکات تا بناغەی بۆ دابرێژرێت و دەست بەسەر ئەم کارانە دەگرێت و ئێوە تەنیا بینەر دەبن. نەسر وتی: وتەکانی تۆ هاوشێوەی نەبوونی وەفاداری و ڕەشبینییە لەجیاتی هاورێیەتی. عیسا وتی: حارس بەناچاری دەبێت بکوژرێت و لەدار بدرێت. دوور نییە ئەم چارەنووسە یەخەی کرمانیش بگرێتەوە.

کاتێك نەسر لەمەرو ڕۆشتەدەر، کرمانی دەستی بەسەردا گرت. وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە و ئەمانی پێبەخشین. ماڵەکانی وێران و سامانەکانی تالآن کرد. حارس سەرکۆنەی ئەم کارانەی کرد. کرمانی بیری لەهێرش کردن و کوشتنی ئەو کردەوە بەڵام دواتر، بیرۆکەکەی پشتگوێ خست.

بیشر کوڕی جورموزی زەببی لەگەڵ پێنج هەزار شەڕکەر، خۆی بەدوور گرت و بەحارسی وت: من لەبەر ئەوە لەشەڕەکان هاوکاری تۆم کرد چوونکە خوازیاری دادپەروەری بوویت، ئێستا کە لەگەڵ کرمانیدایت، لەبەر ئەوە دەجەنگیت تا بڵێن، حارس، سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەمانە بەهۆی داوەری کردنی پێشینە شەڕ دەکەن و من بەشداری شەڕەکانی تۆ ناکەم چوونکە دەستەیەکین بەدوای دادپەروەریدا دەگەڕێین وتەنیا لەگەڵ خراپەکاران، دەجەنگین.

حارس ڕۆشتە مزگەوتی عەبیاز و کەسی بەدوای کرمانیدا ڕەوانە کرد و پێشنیاری پێکرد فەرمانڕەوایی کردنی خەڵکان بەئەنجومەنی راوێژکاری بسپێرێت. کرمانی رازی نەبوو و حارس لێی جیابوویەوە. هەر دووکیان بۆ ماوەیەك دەستیان لەشەڕ و ئاژاوە، هەڵگرت.

دواتر حارس لەدیوارەکە نزیك کەوتەوە و کەلێنێکی تیا دروست کرد و ڕۆشتە ناو شارەکە و بۆ هێرش کردنە سەر کرمانی، پێشڕەوی دەستپێکرد. شەڕیان دەستپێکرد و شەڕ لەنێوان ئەوان رووی لەدژواری کرد. حارس شکستی خوارد و سوپاکەی کرمانی، ئەو کەسانەی کوشتار کرد کەلەنێوان کەلێنەکە و لەشکرگەکەی حارسدا بوون. حارس سوار ئێستر بوو. دابەزی و سواری ئەسپێك بوو و لەگەڵ سەد پیاوی شەڕکەر، خۆڕاگری کرد. لای دارێکی زەیتوون کوژرا یا لەژێر داری سوونجو. سوادەی برایشی کوژرا و جگە لەم دووانە، کەسانێکی دیکە لەخوێنی خۆیاندا گەوزان.

دەستەیەك دەڵێن: داستانی کوژرانەکەی بەمشێوەیە: پیاوی کەرمانی هێرشی کردە سەر بیشر کوڕی جورموز کەپێشتر ئامازەمان بەخۆ بەدوور گرتنی ئەو لەشەڕەکاندا. حارس کوڕی سورەیج لەگەڵ ئەودا بوو. کرمانی چەند رۆژێك لەنێوان ئەو و لەشکرگەکەی بیشر کەدوو فەرسەخ بوو، چاوەڕوان و دواتر مەبەستی شەڕکردنی کرد. حارس بۆ شوێنکەوتنی کرمانی داخی خوارد و وتی: لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەوان پەلە مەکە و من ئەوان لەتۆ دوور دەخەمەوە. ئەو لەگەڵ دە سوار، ڕۆشتە ناو سوپاکەی بیشرو چەند رۆژێکی لەگەڵ سوپاکەی ئەودا بەسەر برد. موزەرییەکان لەهاوەڵانی حارس، لەلەشکرەکەی کرمانییەوە، پەیوەستی بوون. جگە لەسەلە کوڕی ئەبی عەبدوللە، هیچ کەسێك لەخەڵکانی موزەر، لەناو سوپاکەی کرمانیدا نەمایەوە. وتی: حارس کەسێکی فێڵبازە. هەروەها موهەلیب کوڕی ئەیاس وتی: حارسم بەردەوام بەشێوەیەك بینیوە کەسوارەکان شوێنی کەوتوون. کرمانی چەند جارێك شەڕی لەگەڵ ئەوان تاقی کردەوە، دەیانکوشت و بۆ سەنگەرەکانی خۆیان دەگەڕانەوە. هەندێ کات سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا و هەندێ کات شکستیان دەخوارد.

حارس دوای چەند رۆژ کۆچی کرد و لەژێر دیوارەکەی مەرو، ڕێڕەوێکی ژێرزەمینی لێدا وڕۆشتە ناوی. کرمانی شوێنی کەوت. موزەرییەکان بەحارسیان وت: کاتێك لەناو سەنگەرەکانی خۆمان هاتینەدەر، رۆژی سەرکەوتنی ئێمەیە بەڵام تۆ چەندین جار هەڵاتوویت، دابەزە. وتی: ئەگەر سوارە بم، باشترم بۆ ئێوە لەوەی پیادە بم. وتیان: تەنیا بەوە رازی دەبین دابەزیت. دابەزی. شان بەشانی حارس شەڕیان کرد. حارس وبراکەی

وبیشر کوڕی جورموز و دەستەیەك لەسوارکارەکانی تەمیم کوژران و کەسانی دیکە، هەڵاتن و مەرو، باوەشی بۆ خەڵکانی یەمەن کردەوە. ماڵی موزەرییەکانیان وێران کرد. کاتێك حارس کوژرا، نەسر کوڕی سەیار وتی:

| | |
|---|---|
| یا مدخل الدل علی قومه | بعدا و سحقا لك من هالك |
| شؤمك اردی مضرا کلها | و حز من قومك بالحالك |
| ما کانت الازد و اشیاعها | تطمع فی عمرو و لا مالك |
| و لا بنی سعد اذا الجموا | کل طمو لونه حالك |

یانی: ئەی ئەو کەسەی ریسوایی بەخەڵکەکەی خۆت دەبەخشیت، دوور و لەناوچوو بیت چەندە کوژراوێکی شووم بوویت. شوومی تۆ هەموو موزەرییەکانی بەرەو مەرگ برد و خەڵکەکەتی لەبەرزایی کێوەکانەوە خستەخوار. ئەخەڵکانی ئەزد چاوی تەماحیان بڕیبووە عەمرۆ یا مالك نە شوێنکەوتەکانیان و نە منالەکانی سەعد لەو کاتەی جڵەوی ماینەکانیان توند دەکەن و سوار ئەسپە تیژپێ و چالاکەکان دەبن.

عەمرۆ کوڕی مالك و سەعد دوو تیرە لەتیرەکانی تەمیمن. دەستەیەك دەڵێن: ئەم هۆنراوەیە لەنەسر سەبارەت بەعوسمان کوڕی سەدەقەیە. دایکی کەسیر زەببی وتی:

| | |
|---|---|
| لا بارك الله فی انثی و عذبها | تزوجت مضریا آخر الدهر |
| ابلغ رجال تمیم قول موجعة | احللتموها بدار الذل و الفقر |
| ان انتم لم تکروا بعد جولتکم | حتی تعیدوا رجا الازد فی الظهر |
| انی استحیت لکم من بعد طاعتکم | هذا المزونی یحییکم علی قهر |

یانی: خوا پیرۆزی نەبەخشێت بەو مێینەی تا کۆتایی رۆژگار لەگەڵ پیاوێکی موزەری، پەیوەندی هاوسەرگیری دەبەستێت. خواوەند ئەشکەنجەی بکات. وتاری ژنێکی بەئازار بەپیاوانی تەمیم بگەیێنە کەئەوتان لەماڵی ئەزانی و ریسواییدا گرفتار کرد: ئەگەر دوای ئەمە هێرش نەکەن و پیاوانی ئەزد بۆ پشتی باوکانیان نەگەڕێننەوە، من شەرمەزارم کەفەرمانەکانی ئەم مەزوونییە ئەنجام دەدەن کەبەزۆر باج لەئێوە دەستێنێت.

## شوێنکەوتەکانی بەنی عەبباس

لەم ساڵەدا، ئیبراهیم رێبەر، ئەبوو موسلیمی خوراسانی بۆ خوراسان نارد لەکاتێکدا تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو. نامەی بۆ شوێنکەوتەکانی نووسی: من فەرمانەکانی خۆم بەو

سپاردووە، فەرمانبەر و گوێرایەڵی ئەو بن چوونکە فەرمانڕەوای خوراسان و هەموو ئەو شوێنانەیە کەلەمە بەدوا، بەسەریاندا زاڵ دەبێت. ئەبوو موسلیم ڕۆشتە لای ئەوان بەڵام بەوتەکانی ڕازی نەبوون. بۆ ساڵی داهاتوو ڕۆشتنە مەککە و پێکەوە، چاویان بەئیبراهیم کەوت. ئەبوموسلیم ئەوی ئاگادار کردەوە کەفەرمان و نووسراوەکەی ئەویان بەکار نەبردووە. ئیبراهیم وتی: من ئەم پێشنیارەم بەزۆر کەس کردووە و ڕازی نەبوون.

پێشنیاری بەسلێمان کوڕی کەسیر کردبوو. وتبووی: هەرگیز تەنانەت بەفەرمانڕەوایی بەسەر دوو جەستە ڕازی نابم. بەئیبراهیم کوڕی سەلە پێشنیاری کرد بەڵام ڕازی نەبوو. دواتر ئەوانی ئاگادار کردەوە کەئەبوو موسلیمی هەڵبژاردووە. فەرمانی فەرمانبەری کردنی ئەوی پێدان و دواتر پێی وت: تۆ پیاوێك لەبنەماڵەی ئێمەیت، پێشنیارەکانی من لەگووێ بگرە، سەیری ئەم هۆزە یەمەنییە بکە، بەردەوام پەیوەستی ئەوان بە و هاورێیەتی ئەوان هەڵبژێرە چوونکە خواوەند تەنیا بەهاوکاری ئەوان، سەرکەوتنمان پێدەبەخشێت. لەخەڵکانی ڕەبیعە و کارەکانیان گومان بکە و بزانە موزەرییەکان، دوژمنانی دراوسێی تۆن. هەرکەست پەسەند نەکرد، بیکوژە و ئەگەر توانیت هەموو عەرەبەکانی خوراسان بکوژیت، مۆڵەتیان پێمەدە. هەر کوڕێك باڵای گەشتە پێنج بست و گومانی تۆی بزواند، بیکوژە و لەگەڵ ئەم پیرە پیاوە، سلێمان کوڕی کەسیر، دژایەتی مەکە و گوێ لەفەرمانەکانی بگرە. ئەگەر لەکارێك گومانت بۆ دروست بوو، تەنیا لەگەڵ خۆم ڕاوێژ بکە.

گێڕانەوەکانی دیکە سەبارەت بەئەبوو موسلیم، بەخواستی خوا، لەگێڕانەوەی ڕووداوی ساڵەکانی داهاتوو، باس دەکەین.

## کوژرانی زوحاکی خارجی

پێشتر ئاماژەمان پێدا زوحاك کوڕی قەیسی خارجی، گەمارۆی خستە سەر عەبدوڵڵە کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز. کاتێك ماوەی گەمارۆکە درێژەی کێشا، پێشنیاریان پێکرد ئەو بۆ لای مەروان دوور بخاتەوە. باوکی عومەر پەیامی بۆ نارد: مانەوەی ئێوە بۆمن گران یا دژوار نییە، ئەوە مەروانە. هێرش بکەسەر ئەو چوونکە ئەگەر شەڕی لەگەڵ بکەیت، هاورێیەتی و هاوکاری تۆ دەکەم. ئاشتی لەگەڵ کرد و بۆ لای ئەو ڕۆشت، لەپشت سەری ئەو نوێژی خوێند و ڕووی کردە کوفە. خەڵکانی موسڵ نامەیان بۆ زوحاك نووسی و بانگێشتیان کرد تا دەستی بۆ سەر مەروان ئاوەڵا بکەن. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی، دوای بیست مانگ،

بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت. فەرمانداری موسڵ، بەنوێنەرایەتی مەروان، پیاوێك لەمناڵەکانی شەیبان بەناوی قەتەران کوڕی ئەکمە بوو. خەڵکانی موسڵ، دەروازەی شارەکەیان کردەوە و زوحاك ڕۆشتە ناو شارەکە. قەتەران و سوپاکەی، ڕوبەڕوویان بوونەوە تا کوژران. زوحاك بەسەر موسڵ و شارەکانی دەوروبەری، زاڵ بوو.

هەواڵی ئەم کارە کاتێك بەمەروان گەیشت کەگەمارۆی خستبووە سەر حمس و شەڕی لەگەڵ خەڵکەکەی دەکرد. نامەی بۆ کوڕەکەی عەبدوالله کوڕی مەروان نووسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو نەسیبین بەڕێکەوێت و ڕێگە نەدات زوحاك لەنێوان جەزیرە، جێگیر ببێت. عەبدوالله لەگەڵ حەوت یا هەشت هەزار پیاوی شەڕکەر بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت. زوحاك ڕووی کردە نەسیبین و لەوێ، گەمارۆی خستە سەر عەبدوالله. زوحاك، زیاتر لەسەد هەزار پیاوی شەڕکەر، هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەو دووان لەفەرماندەکانی خۆی لەگەڵ چوار هەزار یا پێنج هەزار شەڕکەری بۆ ڕەققە ڕەوانە کرد. دانیشتوانی شارەکە ڕووبەڕوویان بوونەوە. مەروان کەسی نارد و ئەوانی لەوێ دەرباز کرد.

مەروان بۆ شوێنی مانەوەی زوحاك بەڕێکەوت. ئەم دووانە لەنزیك کەفەرتوسا لەشارەکانی ماردین، ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. سەراسەری ڕۆژ، شەڕی لەگەڵ کرد. کاتێك ئێواری داهات، زوحاك و ئەو دەستە لەهاوەڵانی کەبەهێز و دوور ئەندێش بوون، دابەزین. ژمارەیان دەگەیشتە شەش هەزارکەس. شەڕکەرانی دیکە نەیاندەزانی چی ڕوویداوە. سوارەکانی مەروان گەمارۆیاندان و تێکۆشانە شەڕیان دەکرد و لەگەڵ دەستپێکردنی تاریکی شەو، هەمووی ئەوانیان کوشت. لەسەرەتای شەو، شەڕکەرانی دیکەی زوحاك بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە و نەیاندەزانی زوحاك کوژراوە. هەروەها مەروانیش لەم ڕووداوە ئاگادار نەبوو. یەکێك لەو کەسانەی ئەوی بینیبوو، هاتە لای کەسەکانی و لەڕاستییەکان ئاگاداری کردنەوە. ئەوان گریان و شین وڕۆڕۆیان دەستپێکرد. یەکێك لەفەرماندەکان ڕۆشتە لای مەروان و ئاگاداری کردەوە. بەودا، چرا و مۆمدانەکانی ڕەوانە کرد و بەناو کوژراواندا گەڕان و ئەویان دۆزییەوە. لەسەر و ڕیشی شوێنەواری نزیکەی بیست زەربەی شمشێریان بینی. تەکبیریان وت و سوپاکەی زوحاك زانییان سوپاکەی مەروان لەکوشتنی ئەو، ئاگادار بوونەوە. مەروان سەری ئەوی بۆ شارەکانی مەداین نارد و لەوێ، بەناو خەڵکاندا سووڕاندیان.

دەستەیەك دەڵێن: زوحاك لەساڵی ١٢٩/ ٧٤٧ زایینی کوژرا.

## کوژرانی خەیبەری و فەرمانڕەوای شەیبان

کاتێك زوحاك کوژرا، سوپاکەی، شەویان بەسەر برد. و کاتێك بەرەبەیان هات، لەگەڵ خەیبەری بەیعەتیان کرد. ئەو ڕۆژ مانەوە و بەیانی ئەو ڕۆژە ڕووبەڕوی سوپاکەی مەروان بوونەوە. سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، لەگەڵ خەیبەریدا بوو. پێشتر هاوڕێیەتی زوحاکی دەکرد و ئێمە ئاماژەمان بەهۆکاری هاتنی ئەودا.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو ئەو لەنەسیبین هاورێ لەگەڵ سێ هەزار شەڕکەر لەموالی و کەسەکان و هاوەڵانی، ڕۆشتە لای زوحاك. خوشکەکەی ئەو لەگەڵ شەیبانی حروری کەدوای کوژرانی خەیبەری، خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو، پەیوەندی هاوسەریەتی بەست. خەیبەری لەگەڵ چوارسەد سوارە لەسوپاکەی خۆی، هێرشی کردە سەرمەروان. مەروان کە لەدڵی سوپاکەیدا بوو، شکستی خوارد بەناچاری لەناو لەشکرگەکەی خۆی هاتەدەر. خەیبەری و سوارەکانی ڕۆشتنە ناو لەشکرگەکەی ئەوان و دروشمەکەی خۆیان بەرز کردەوە و هەرکەسیان گرت، کوشتیان تا گەشتنە خێوەتەکەی مەروان و تەناف خێوەتەکەیان بڕی و خەیبەری لەسەر فەرشەکەی ئەو دانیشت. باڵی ڕاستی سوپاکەی مەروان بەهێز بوو هەروەها باڵی چەپیش. فەرماندەیی باڵی چەپ لەدەستی ئیسحاق کوڕی موسلیمی عەقیلیدا بوو. کاتێك سوپاییەکان، ژمارەی کەمی هاوەڵانی خەیبەریان بینی، کۆیلەکانیان بەستوونی خێوەتەکان، هێرشیان کردنەسەر و خەیبەری و هەمووی هاوەڵانی ئەویان لەخێوەتەکەی مەروان و دەوروبەری کوشتار کرد.

ئەم هەواڵە بەمەروان گەیشت کەنزیکەی پێنج یا شەش میل لەلەشکرگەکەی دوور کەوتبوویەوە. بۆ لای سوپاکەی گەڕایەوە و سوارەکانی، لەشوێنەکانی خۆیاندا، جێگیر کردەوە. شەوی لەناو لەشکرگەکەی بەسەر برد. سوپاکەی خەیبەری گەڕانەوە و شەیبانیان وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. مەروان بەدەستە شەڕکەرەکان، شەڕی لەگەڵ کردن و لەم ڕۆژە بەدواوە، ڕیزکردنی شەڕکەران بوو بەشتێکی بێ هۆ و فیڕۆ.

## بەسەرهاتی حەمزەی خارجی لەگەڵ تالبی حەق

ناوی حەمزەی خارجی موختار کوڕی عەوف ئەزدی سولەمی بەسری بوو. سەرەتای کارەکەی بەمشێوە بوو کەیەکێك بوو لەخەواریجی ئەبازی. ساڵانە لەکاتی حەج، دەڕۆشتە

شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکان بۆ دژایەتی و شەڕ دژی مەروان کوڕی محەممەد هانی دەدان. بەمشێوە بوو تا لەکۆتایی ساڵی ١٢٨/ نوتی ٧٤٦ زایینی، لەگەڵ عەبدواللە کوڕی یەحیا ناسراو بەناوی ( ئەوی بەدوای راستی و دروستی دەگەڕێت، یا خوازیاری راستی) تالبی حەق، کۆبوویەوە و یەکیان ناسی. پێی وت: قسەیەکی باش ببیستە چوونکە دەبینم پێشنیاری رێگەی راست و دروست بەخەڵکان دەکەیت. لەگەڵ من وەرە چوونکە خەڵکەکەم، گوێرایەڵی فەرمانەکانی منن.

بەرێکەوت تا گەیشتە حەزرەمەوت. باوکی حەمزە لەسەر بنەمای خەلافەت، بەیعەتی لەگەڵ کرد و ئەوانی بۆ نافەرمانی کردنی مەروان و بنەماڵەی مەروان هاندا. جارێك باوکی حەمزە لای مەعدەنی منالەکانی سەلیم تێپەڕی کەفەرمانڕەواکەی کەسیر کوڕی عەبدواللە بوو. وتەکانی باوکی حەمزەی بیست و چل قامچی لێدا. کاتێك باوکی حەمزە بوو بەفەرمانداری مەدینە و دەستی بەسەردا گرت، کەسیر لەوێ ڕۆشت و خۆی شاردەوە تا ئەوەیان بەسەرهات کەئاماژەمان بەداستانەکەیاندا.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

بەوتەی هەندێ کەس، لەم ساڵەدا مەروان، یەزید کوڕی هوبەیرەی بۆ عێراق ڕەوانە کرد تا لەگەڵ خەواریجی ئەو دیارە، شەر بکات.

عەبدولعەزیز کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، لەم ساڵەدا نایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان بەست کەفەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف بوو.

کارگوزاران لەم ساڵەدا، ئەم کەسانە بوون: زوحاکی خارجی فەرمانڕەوایەتی عێراق و عەبدواللە کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز ، دادیاری بەسرە سومامە کوڕی عەبدواللە کوڕی ئەنس و لەخوراسان، نەسر کوڕی سەیاری فەرمانڕەوایەتی دەکرد کەئاژاوە لەناو ئەو شارەدا فراوان ببوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عاسم کوڕی ئەبی نەجوودی زانا، قورئان خوێنی قورئان زان، یەعقوب کوڕی عوتەبە کوڕی ئەخنەسی مەدەنی سەقەفی، جابر کوڕی یەزیدی جوعفی، ئەبوو زوبەیر محەممەد کوڕی موسلیم کوڕی تەدرووسی مەککی زوبەیری، جامع کوڕی شەداد، ئەبوو قەبیلی موعافەری کەناوی حویەی کوڕی هانی موفەری بوو. سەعید کوڕی مەسروقی سوەری باوکی سوفیانی سوەری کەپیاوێکی شارەزا لەگێڕانەوەی حەدیسدا بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و نۆی کۆچی (( ٧٤٧ زایینی ))

## چارەنووسی شەیبانی خارجی تا کوژرانی

ناوی، شەیبان کوڕی عەبدعەزیز باوکی دولەف یەشکوری بوو.

هۆکاری کوژرانەکەی ئەمە بوو: کاتێك خواریج، دوای کوژرانی خەیبەری بەیعەتیان لەگەڵ کرد، جڵەوی کارەکانی گرتەدەست و رۆژگاری بەشەڕ کردن لەگەڵ مەروان بەسەر برد. زۆربەی ئەو کەسانەی چاوی تەماحییان بڕیبووە ژن و زێڕ و زیو، لەدەوری شەیبان بڵاوەیان لێکرد و تەنیا چل هەزار پیاوی شەڕکەری لەگەڵ مایەوە. سلێمان کوڕی هوشام پێشنیاری پێکردن بەرەو موسڵ بڕۆن. کۆچیان کرد و مەروان شوێنیان کەوت تا گەیشتنە موسڵ. لەرۆژهەڵاتی دیجلە، ئوردویان لێدا و پردەکانیان هەڵبەست کە لەشوێنی مانەوەی ئەوان تا شارەکە، درێژ دەبوویەوە. خواردن و پێداویستییەکانیان لەم رێگەوە دابین دەکرا. مەروان لەبەرابەر ئەوان ئوردوی لێدا. خەواریج لە (کار) ئوردویان لێدابوو و مەروان لەخوسسە. خەڵکانی موسڵ لەبەرژەوەندی خەواریج شەڕیان دەکرد. مەروان بۆ ماوەی شەش یا نۆ مانگ، مایەوە و شەڕی لەگەڵ کردن.

لەم کاتەدا یەکێك لەبرازاکانی سلێمان کوڕی هوشام، بەناوی ئومەییە کوڕی معاویە کوڕی هوشامیان بردە لای مەروان. ئەو، ئەسیر و لەگەڵ مامی سلێمان لەناو سوپاکەی شەیباندا بوو. دەستیان بڕییەوە و کوشتیان. مامی سەیری دەکرد.

مەروان نامەی بۆ یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە نووسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ هەموو شەڕکەرانی لەقرقیسیاوە روو بکاتە عێراق. موسەنا کوڕی عیمرانی عایزی، فەرمانڕەوایەتی کوفەی دەکرد. ئەو جێگری خەواریج بوو لەعێراق. لەعەین تەمەر رووبەرووی کوڕی هوبەیرە بوویەوە و شەڕێکی قورسیان ئەزموون کرد. خەواریج پاشەکشێیان کرد و دواتر لەنوخەیلیەی کوفە، کۆبوونەوە. کوڕی هوبەیرە، شکستیدان. ژمارەیان لەبەسرە فراوان و شەیبان، عوبەیدە کوڕی سەواری لەگەڵ سوارەکانی گوشەن، بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد کە لەبەسرە روبەرووی یەکبوونەوە و خەواریج شکستیان خوارد و عوبەیدە کوژرا و کوڕی هوبەیرە، لەشکرگەکەی ئەوانی تالان کرد. کوڕی هوبەیرە دەستی بەسەر هەموو عێراقدا گرت و مەترسییان بۆ سەر خۆیان نەهێشت.

مەنسور کوڕی جمهور لەناو سوپای خەواریجدا بوو. هەڵات و دەستی بەسەر ماهین و

سەراسەری کوێستاندا گرت. کوڕی هوبەیرە ڕۆشتە واست و کوڕی عومەری گرت و زیندانی کرد. نوباتە کوڕی حەنزەلەی (فەرمانداری شارەکانی ئەهواز) بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سلێمان کوڕی حەبیب، ڕەوانە کرد. سلێمان ئەم هەواڵەی بیست و داوود کوڕی حاتەمی بۆ شەڕی نوباتە نارد. لەمورتان لەکەنارەکانی دوجەیل ڕوبەڕووی یەك بوونەوە و شەڕیان کرد. خەڵکان شکستیان خوارد و هەڵاتن و داوود کوژرا.

کاتێك کوڕی هوبەیرە دەستی بەسەر عێراقدا گرت، مەروان نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا عامر کوڕی زوبارەی موڕی بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. کوڕی هوبەیرە ئەوی لەگەڵ حەوت یا هەشت هەزار پیاوی شەڕکەر، بەرێکرد. ئەم هەواڵە بەشەیبان گەیشت و ئەو، جەوەن کوڕی کەلابی خارجی لەگەڵ دەستەیەك ڕەوانە و لە (سن) ڕووبەڕووی عامر بوونەوە و شکستیان پێهێنان. عامر، ڕۆشتە ناو سن و لەقەڵاکەیدا، سەنگەری گرت. مەروان بەردەوام لەرێگەی وشکانییەوە، سوپای بۆ هاوکاری کردنی ئەو ڕەوانە دەکرد و بەمشێوەیە، ژمارەی سوپاکەی عامر، فراوان بوو.

مەنسور کوڕی جمهور، لەکوێستانەکانەوە، سامان و دارایی بۆ شەیبان دەنارد. کاتێك سوپاکەی عامر فراوان بوو، بەمەبەستی شەڕ لەگەڵ جەوەن و خەواریج بەرێکەوت و شەڕیان دەستپێکرد و توانی شکستیان پێبێنێت. جەوەن کوژرا و کوڕی زوبارە، بەرەو موسڵ، گەڕایەوە.

کاتێك شەیبان لەکوژرانی جەوەن ئاگادار بوویەوە و بیستی عامر بەمەبەستی هێرش کردن بۆ سەر سوپاکەی بەرێکەوتووە، پەسەندی نەکرد لەنێوان ئەو دوو سوپایەدا بمێنێتەوە. لەبەر ئەمە خەواریجی لەگەڵ خۆی برد. عامر لەموسڵ، مەروانی بینی. مەروان ئەوی لەگەڵ سوپایەکی گەورە، بەدوای شەیباندا، ڕەوانەی کرد. ئەگەر دەڕۆشت، دەڕۆشت و ئەگەر دەمایەوە، دەمایەوە. نەیدەویست شەڕ دەستپێبکات بەڵکو دەیویست، شەیبان ئەو کارە بکات. ئەگەر شەیبان شەڕ هەڵگیرسێنێت، ڕووبەڕووی ببێتەوە و ئەگەر دەستی لەشەڕ هەڵگرت، دەست هەڵگرێت و بڕوات و شوێنی بکەوێت. بەمشێوە بوو تا لەکوێستانەکان تێپەڕین ولەبەیزیای فارس، دابەیزن کەعەبدوالله کوڕی معاویە کوڕی حەبیب کوڕی جەعفەر، لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەوێ بوون. کاروباری نێوان ئەم دووانە سەقامگیر نەبوو. بەرێکەوت و لەجیرۆفتی کرمان دابەزی. عامر کوڕی زوبارە بەرێکەوت و لەبەرابەر کوڕی معاویە دابەزی و بۆ ماوەیەك مایەوە دواتر شەڕی دەستپێکرد. کوڕی معاویە، شکستی

خوارد و رووی کردە هەرات. کوڕی زوبارە و سوپاکەی بەرێکەوتن تا لەجیرۆفت روبەرووی شەیبان بوونەوە و شەڕێکی قورس دەستپێکرد. خەواریج، شکستیان خوارد و لەشکرگەکەیان تالآن کرا. شەیبان، ڕۆشتە سیستان و لەوێ لەناوچوو. ئەم رووداوە، لەساڵی ١٣٠/ ٧٤٨ زایینی روویدا.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو، بەڵکو شەڕی مەروان و شەیبان لەموسڵ، یەك مانگ درێژەی کێشا. شەیبان شکستی خوارد و بۆ فارس ڕۆشت و عامر کوڕی زوبارە شوێنیکەوت. شەیبانی رووی کردە دوورگەی، کوڕی کاوان و دواتر لەوێ کۆچی کرد. جولەندی کوڕی مەسعود کوڕی جەیفەر کوڕی جولەندی ئەزدی، لەساڵی ١٣٤/ ٧٥٢ زایینی، ئەوی کوشت. (دواتر ئاماژەی پێدەدەین) سلێمان و هاوەڵانی و کەسەکانی سوار کەشتی بوون و بەرەو سند، بەرێکەوتن.

کاتێك سەفاح، لەسەر تەختی خەلافەتی عەباسی دانیشت، سلێمان ڕۆشتە لای. رێزی لێگرت و دەستی پێدا تا ماچی بکات. کاتێك سودەیف، کۆیلەی سەفاح، ئەمەی بینی، رووی تێکرد و وتی:

| | |
|---|---|
| لا یغرنك ما تری من رجال | ان تحت الضلوع داءا دویا |
| فضع السیف و ارفع السوط حتی | لا تری فوق ظهرها امویا |

یانی: بەوەی لەناخی هەندێ کەسدا دەیبینی، فریو مەخۆ چوونکە لەژێرپەراسووەکان، ئازارە گیانبڕەکانە. قامچی هەڵبگرە و شمشێر بخەرە ناویان تا لەسەر زەوی، یەك ئومەوی نەبینی.

سلێمان وەڵامی دایەوە و وتی: ئەی پیرەپیاو، منت بەکوشتندا! سەفاح هەستا و بەجێیهێشت. سلێمانیان گرت و کوشتیان.

مەروان دوای بەرێکەوتنی شەیبان لەموسڵ، بۆ ماڵەکەی لەحەڕان گەڕایەوە و مایەوە تا ئەو کاتەی ڕۆشتە زاب.

## ئاشکرا بوونی بانگەوازی عەباسییەکان لەخوراسان

لەم ساڵەدا ئەبوو موسلیمی خوراسانی، لەخوراسانەوە ڕۆشتە لای ئیبراهیمی رێبەر. ئەبوو موسلیم لەنێوان خوراسان و ئیبراهیم، هاتوچۆی دەکرد.

لەمساڵەدا، ئیبراهیم نامەی بۆ ئەبوو موسلیم نووسی و بانگی کرد تا سەبارەت

بەبارودۆخی خەڵکان، پرسیاری لێبکات. ئەو لەنیوەی جەمادی الثانی/ سێی مارسی ٧٤٧ زایینی، لەگەڵ حەفتا کەس لەگەورەکان، بەمەبەستی بینینی ئیبراهیم بەرێکەوت. کاتێك گەیشتنە دەندانەگان، لەپانتایی خوراسان، کامل یا باوکی کامل، لەسەر رێگەکەی قووت بوویەوە و پرسی بەرەو کوێ دەڕوات. وتی: حەج. دواتر ئەبوموسلیم بەتەنیا لەگەڵی دانیشت و بانگەوازی عەباسییەکانی پێ پێشنیار کرد. کامل، رازی بوو. دواتر ئەبوو موسلیم ڕۆشتە نەسا کەفەرماندارەکەی، سلێمان کوڕی قەیسی سولەمی بەنوێنەرایەتی لەنەسر کوڕی سەیار، فەرمانڕەوایەتی دەکرد. کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە، فەزل کوڕی سەلمانی تووسی بۆ لای سەیید کوڕی عەبدوڵڵەی خوزاعی نارد تا لەهاتنی خۆی ئاگاداری بکاتەوە. ڕۆشتە یەکێك لەگوندەکانی نەسا و پیاوێکی شیعی بینی و سەبارەت بەئەسید، پرسیاری لێکرد. ئەوی دوور خستەوە و وتی: هۆکاری زیان بوو لەم شارەدا، لەدوو پیاو، هەواڵی بۆ لای فەرماندار برد. دەوترێت: دوو کەسن بانگەواز دەکەن. ئەم دووانەی لەگەڵ ئەحجەم کوڕی عەبدوڵڵە و غەیلان کوڕی فەزالە و غالب کوڕی سەعید و موهاجیر کوڕی عوسمان، دەستگیر کرد. فەزل بۆ لای ئەبوو موسلیم گەڕایەوە و لەبارودۆخ، ئاگاداری کردەوە. لەرێگەکە، لایدا و تەرخانی، حەماڵی (بارەبەر) نارد وئەسید و هەموو شیعەکانی کۆکردەوە. ئەسیدی بانگ کرد و هاتە پێش. پرسیاری بارودۆخی کرد و ئەسید وتی: ئەزهەر کوڕی شوعەیب و عەبد مەلیك کوڕی سەعید، بەنامەیەك لەلایەن رێبەرەوە هاتن و لای من بەجێیان هێشت. خۆیان ڕۆشتنەدەر و دەستگیر کران. نازانم چ کەسێك دژی ئەوان، قسەی کردووە. وتی: ئەی نامەکان کوا؟ وتی: لێرەدایە، نامەکانی نیشاندا.

دواتر بەرێکەوت تا گەیشتە قومس کەفەرماندارەکەی، بەیهەس کوڕی بوودەیلی عێجلی بوو. بەیهەس ڕۆشتە لای ئەوان و پرسی: مەبەستی کوێتان هەیە؟ وتیان: حەج. کاتێك لەقومس بوو، نامەی ئیبراهیمی بەدەست گەیشت و نامەیەك بۆ سلێمان کوڕی کەسیر نێردرا کەتیایدا بۆ ئەبوو موسلیم، نووسرا بوو: من ئاڵای سەرکەوتنت بۆ ڕەوانە دەکەم. لەهەر شوێنێك نامەکەی من بەدەست بگات، بگەڕێرەوە و قەحتەبە و ئەوەی هەڵتگرتووە، بۆ منی بنێرە تا لەشوێنی ئەنجامدانی ئایینی حەج، چاوی بەمن بکەوێت.

ئەبوو موسلیم بۆ خوراسان گەڕایەوە و قەحتەبەی لەگەڵ نامەکان و پرسیار و پێشنیار و سامانەکان بۆ لای رێبەر، ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتنە نەیشابوور، فەرماندەی پادگان، رێگە لێگرتن و لەکار و مەبەستی ئەوانی پرسی. وتیان: مەبەستی ڕۆشتن بۆ مەککە و حەجمان

لەسەردابوو و لەرێگەی لێی دەترسایین، خۆمان بەدوور گرت. فەرمانی بەموفەزەل کوڕی سەرقی سولەمیدا، ئەشکەنجەیان بدات. ئەبوو موسلیم، بەتەنیا لەگەڵی دانیشت و لەکاروباری خۆی ئاگاداری کردەوە. رازی بوو و لای ئەوان مایەوە تا ئەو کاتەی بەناسوودەییەوە بەرێکەوتن.

ئەبوو موسلیم رۆشتە مەرو و نامەی رێبەری بەسلێمان کوڕی کەسیردا کەفەرمانی پێدەدا، بانگەوازەکەی، ئاشکرا بکات. ئەبوو موسلیمیان بۆ ئەم کارە دیاریکرد و وتیان: پیاوێك لەبنەماڵەی پێغەمبەرە. پێشنیاری شوێنکەوتنی عەباسییەکانی بەخەڵکان کرد وبۆ کەسانی دوور و نزیك، پەیك و پەیامیان نارد و فەرمانیان پێدان، بانگەوازەکەی خۆیان ئاشکرا بکەن و پێشنیاری شوێنکەوتنی عەباسییەکان بخەنە بەردەم خەڵکان.

ئەبوو موسلیم، لەیەکێك لەگوندەکانی مەرو، بەناوی فەنین، لای باوکی حەکەم عیسا کوڕی ئەعیەن، دابەزی و لەوێوە، باوکی داوودی گەورەی لەگەڵ عەمرۆ کوڕی ئەعیەنی بۆ تەخارستان تا نزیکترین شوێنی بەڵخ ڕەوانە و فەرمانی پێدان لەمانگی رەمەزان، مەی ٧٤٧ زایینی، بانگەوازەکەی خۆیان، ئاشکرا بکەن. دابەزین لەم گوندە لەشەعبان/ ئاوریلی ٧٤٧ زایینی بوو. ئەو، نەزر کوڕی سەبیحی تەمیمی و شەریك کوڕی غەزی تەمیمی بۆ مەرورود ڕەوانە کرد تا لەمانگی رەمەزان/ مەی، بانگەوازەکەی خۆیان ئاشکرا بکەن. باوکی عاسم عەبدولرەحمان کوڕی سەلیمی بۆ تاڵەقان نارد و جەهم کوڕی عەتییەی بۆ لای عەلا کوڕی حورەیس بۆ خوارەزم ڕەوانە و فەرمانی پێدا پێنج رۆژی بۆ کۆتایی مانگی رەمەزان/ ٩ ژوئەنی ٧٤٧ زایینی، بانگەوازەکەی خۆیان ئاشکرا بکەن. ئەگەر دوژمن پێشتر ئاگادار بوویەوە، و مەبەستی زیان گەیاندن و لەناو بردنی ئەوانی کرد، بۆ ئەوان ڕەوایە، پاسەوانی لەخۆیان و شمشێر لەکالآن دەرکێشن و لەگەڵ دوژمنانی خواوەند، بجەنگن. هەرکەس توانی تا کاتی دیاریکراو، دوژمن گرفتار بکات، ڕەوایە لەکاتی خۆیدا، بانگەوازەکەی بەگوێی خەڵکان بگەیەنێت.

ئەبوو موسلیم لای باوکی حەکەم، رۆشت و لەگوندی ئیسپیدەنگ مایەوە و دوو شەو بۆ کۆتایی مانگی رەمەزان/ ١٢ ژوئەنی ٧٤٧ زایینی، رۆشتە لای سلێمان کوڕی کەسیر. کرمانی و شەیبانی، سەرقاڵی شەڕ کردن لەگەڵ نەسر کوڕی سەیار بوون. ئەبوو موسلیم، بانگەوازەکەی لەناو چینە جۆراوجۆرەکانی خەڵك، ئاشکرا و بڵاو کردەوە. لەیەك شەودا،/ خەڵکان لەشەست گوندەوە، لەدەوری کۆبوونەوە. کاتێك شەوی پێنج شەممە، پێنج شەو بۆ کۆتایی

ڕەمەزان/ ٩ ژوئەنی ٧٤٧ زایینی، هات، ئەو ئالآیەی ڕێبەری بۆی ناردبوو، بەرمێك بەدرێژی سیانزە گەز، بەرزی کردەوە و ئەم ئایەی خوێندەوە: ئاوازێکی بلند لەخواوەندەوە بۆ خەڵکەکەت بەرز بۆتەوە کەخراپەکاران شەڕی لەگەڵ دەکەن. ئاوازەکە، ئەمەیە: ئەوان، ستەمیان لێکراوە و خواوەند، بۆ هاوکاری کردنی ئەوان بەتوانایە (حج/ ٣٩/٢٢). جلّ و بەرگی ڕەشیان پۆشی. ئەبوو موسلیم و سلێمان کوڕی کەسیر و برا و کەسوکاری سلێمان و ئەو دەستە لەخەڵکانی ئیسپیدەنگ بەبانگەوازەکەی ئەوان ڕازی ببوون، هەمان شەو، بۆ شوێنکەوتەکانی خۆیان لەدانیشتوانی گەڕەکی، خەرگان، ئاگریان داگیرساند چوونکە ئەمە نیشانەیەك لەنێوان ئەواندا بوو. بەرەبەیانی زوو، لای ئەو کۆبوونەوە (و هەور وسێبەریان بینی). هەور وسێبەریان بەمشێوەیە لێکدایەوە کەهەور، سەراسەری زەوی دادەپۆشێت و زەوی بێ بەش لەسێبەر نییە بەهەمان شێوە کەتا کۆتایی ڕۆژگار، عەباسییەکان لەفەرمانڕەوایەتی بێ بەش نابن.

بانگەشەکەران لەگەڵ ئەو کەسانەی بەبانگەوازەکە، ڕازی ببوون، لای ئەبوو موسلیم، کۆبوونەوە. یەکەم کەسان لەخەڵکانی (تەقارم) یا (سەقارم) هاتنە لای کەهاوڕێی باوکی وەزاح بوون. نۆسەد پیادە و چوار سوار، لەناو ئەواندا دەبینرا. لەخەڵکانی هەرموز فەرە، دەستەیەك، لەخەڵکانی تەقادم لەگەڵ باوکی قاسم موحریز کوڕی ئیبراهیمی چوپانی، هەزار و سێسەد پیادە و شانزە سوار کەباوکی عەباسی مەروزی لەناو ئەواندا دەبینرا. خەڵکی تەقادم، لەپانتایی ناوچەکانی خۆیانەوە، تەکبیریان دەوت و خەڵکانی دیکەی تەقادم، بەتەکبیر، وەڵامیان دەدانەوە. پەیوەستی سوپاکەی ئەبوو موسلیم لەئیسپیدەنگ بوون. ئەم کۆبوونەوەیە دوو ڕۆژ دوای دەرکەوتنی ئەو بوو. ئەبوو موسلیم قەڵای ئیسپیدەنگی بەهێز کرد و دەروازەکانی بەست.

کاتێك جەژنی ڕەمەزان/ ١٤ ژوئەنی ٧٤٧ زایینی، هات، ئەبوو موسلیم فەرمانی بەسلێمان کوڕی کەسیردا پێشنوێژی بۆ خۆی و شیعەکان بکات. تەختی وتاردانی بۆدانا و فەرمانی پێدا، پێش وتاردان نوێژ دەسپێبکات و بانگ نەڵێت. ئومەوییەکان وتاریان دەخوێندەوە و دواتر بانگیان دەدا. هەروەها ئەبوو موسلیم، فەرمانی بەسلێمان کوڕی کەسیردا، شەش تەکبیر، لەدوای یەك بێنێتە سەرزمان، دواتر نوێژ دەستپێبکات و لەتەکبیری حەوتەم، ڕکوع ببات و لەرەکعەتی دووەم لەنوێژ، پێنج تەکبیر بڵێت و دواتر نوێژ دەستپێبکاتەوە و لەگەڵ تەکبیری شەشەم، ڕکوع ببات و وتاردان بەتەکبیری حەوتەم، دەسپێبکات و بەخوێندنەوەی قورئان

کۆتایی پێبێنێت.

ئومەوییەکان لەنوێژی رۆژی جەژن، لەرەکعەتی یەکەم، چوار تەکبیریان دەوت و لەرەکعەتی دووەم، سێ تەکبیر.

کاتێك سلێمان لەنوێژ تەواو بوو، ئەبوو موسلیم و شیعیەکان بۆ خواردنی نانی نیمەڕۆ بەرێکەوتن کەپێشتر بۆیان ئامادە کرابوو. بەخۆشحالییەوە، سەرقاڵی خواردن بوون.

ئەبوو موسلیم کاتێك لەسەنگەردا بوو، لەکاتی نامە نووسین بۆ نەسر کوڕی سەیار، وشەی فەرمانداری بەکار دەبرد. کاتێك هێز و دەسەڵاتی پەیا کرد و هاوەڵان و شەڕکەرانی زۆری لەدەوری خۆی بینی، بەمشێوەیە نامەی بۆ نەسر نووسی: دوای سڵاو، بزانە خواوەندی پیرۆز، دەستەیەکی لەقورئاندا سەرکۆنە کردووە و فەرموویەتی: بەگەورەترین سوێندەکان بەخواوەندی خوا، سوێندیان خوارد ئەگەر کەسێك رێگەی راستیان نیشان بدات، بۆ دۆزینەوەی رێگەی راست، لەپێش هەموو خەڵکانەوە دەبن. کاتێك رێنیشاندەر رۆشتە لایان، تەنیا بێزاری و ڕەم کردن و یاخی بوون و فریو و فێڵیان زیادی کرد، بەڵام فریو و فێڵی مەترسیدار، یەخەی خاوەنەکەی دەگرێت، ئایا چاوەڕوانی شێوازی کرداری پێشینانن؟ بەدڵنیاییەوە لەشێوەی کردار و کردەوەکانی خواوەند، هیچ گۆڕانکارییەك نابینن هەرچەند زۆر بچوکیش. (فاطر/ ٣٥/٤٢-٤٣) نەسر نامەکەی ئەوی بەگەورە زانی و یەکێك لەچاوەکانی خۆی بەست و وتی: ئەمە نامەیەکە ناتوانین وەڵامی بدەینەوە.

یەکێك لەرووداوەکان لەکاتی مانەوەی ئەبوو موسلیم لەئیسپیدەنگ، ئەوە بوو نەسر یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی یەزید، دوای هەژدە مانگ لەدەرکەوتنی ئەبوو موسلیم، بۆ شەڕی ئەو ڕەوانەی کرد. ئەبوو موسلیمی خوراسانی، مالك کوڕی هەیسەمی خوزاعی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو نارد و لەگوندی ئاسین روبەرووی بوویەوە. مالك پێشنیاری رازی بوون بەخەلافەت و فەرمانڕەوایی بنەماڵەی پێغەمبەری پێکرد. رازی نەبوون و خۆیان بەگەورەتر لەقەڵەمدا. مالك و دووسەد شەڕکەر، لەسەرەتای رۆژ تا ئێوارێ، شەڕیان لەگەڵ کردن. ساڵح کوڕی سلێمانی زەببی و ئیبراهیم کوڕی زەید و زیاد کوڕی عیسا رۆشتنە لای ئەبوو موسلیم و بۆ پەیوەست بوون بەمالك، ڕەوانەی کردن. هاتنی ئەوان لەکاتی نوێژی ئێوارێدا بوو. کۆیلەکەی نەسر وتی: ئەگەر ئەمشەو رێگەیان پێبدەین، بحەسێنەوە، هێزی پشتیوانیان بۆ دەگات. هێرشیان بکەنە سەر. هێرشیان برد و شەڕ بەرەو دژواری رۆشت. عەبدوڵڵەی تایی، هێرشی کردە سەر کۆیلەکەی نەسر و گرفتاری کرد و هاوەڵانی هەڵاتن.

تایی، ئەسیرەکەی خۆی و سەری کوژراوەکانیان بۆ ئەبوو موسلیم نارد. ئەبوو موسلیم سەرە براوەکانی کرد بەنووکی ڕمەکان و چاکەی لەگەڵ کۆیلەکەی نەسر کرد. برینەکانی تیمار و تا کاتی چاکبوونەوە، پەرستاری لێکرد. دواتر پێی وت: ئەگەر بخوازیت لای ئێمە بمێنیتەوە، دەبێت بزانیت ڕێنیشاندانی خواییە و ئەگەر مانەوە پەسەند ناکەیت، بۆ لای گەورەکەت بگەڕێرەوە و پەیمان و سوێندی خوایی بخۆ چیتر بۆ شەڕی ئێمە ناگەڕێیتەوە و درۆمان بۆ هەڵنابەستیت و ئەوەی لەئێمە بینیوتە، بەراستی دەیگێڕیتەوە. کۆیلە، بۆ لای خاوەنەکەی گەڕایەوە و ئەبوو موسلیم وتی: ئەم پیاوە، دەبێتە هۆکاری پەیوەست بوونی چاکەکاران و داوێنپاکەکان بەئێمە چوونکە لای ئەوان، ئێمە باوەڕمان بەئیسلام نییە. بەراستی، لەبەرچاوی ئومەوییەکان بەو شێوەیە بوون چوونکە بۆ بتپەرستی و حەلاڵ کردنی خوێن و سامانی یەکتر و شەریك بوون لەژنانی یەکتر، تۆمەتباریان دەکرن.

کاتێك یەزید، بۆ لای نەسر گەڕایەوە، وتی: بەخێر نەیێتەوە! ئەم خەڵکە تەنیا لەبەر ئەوە تۆیان نەکوشت تا ببیتە هۆکاری زیان گەیاندن بەئێمە. یەزید وتی: بەوشێوەیە تۆ گومان دەکەیت. سوێندیان داوم، سەبارەت بەوان درۆ نەهێنمە سەرزمان. ئێستا دەڵێم: ئەوان لەکاتی خۆیدا، نوێژ دەکەن، قورئان دەخوێنن، بەردەوام ناوی خواوەند، وێردی سەرزمانیانە و پێشنیاری فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، بەخەڵکان دەکەن. گومانم نییە بەم زوانە دەسەڵات دەگرنە دەست، ئەگەر تۆ گەورەم نەدەبوویت، نەدەگەڕامەوە بەڵکو لای ئەوان دەمامەوە. ئەمە یەکەم شەڕی نێوان نەسر و ئەبوو موسلیم بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا، خازم کوڕی خەزیمە، دەستی بەسەر مەروروددا گرت و کارگوزارەکەی نەسری کوشت.

هۆکارەکەی ئەوە بوو: کاتێك ویستی لەو شارە بزوتنەوەکەی دەستپێبکات، (( یەکێك بوو لەشیعەکانی بەنی عەباس)) بەنی تەمیم ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرت. وتی: من پیاوێك لەئێوەم و دەمەوێت دەست بەسەر شارەکەدا بگرم. ئەگەر سەرکەوتنم بەدەست هێنا، شارەکە بۆ ئێوە دەبێت و ئەگەر کوژرام، لەڕەنج و ئازاری من ئاسوودەدەبن. تەمیمیەکان، ڕێگەیان بۆ ئاوەلا کرد. لەگوندی (گەنج گوند) ئوردوی لێدا. نەزر کوڕی سوبەیح، لەلایەن ئەبوو موسلیمەوە، پەیوەستی بوو. کاتێك خازم، لەکاتی شەودا گەیشتە شارەکە، بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر خەڵکان و بیشر کوڕی جەعفەری سەعدی، کارگوزاری نەسری لەرۆژی یەکی زی قەعدە/ ١٤ ژوئیەی ٧٤٧ زایینی، کوشت و هەواڵی سەرکەوتنەکەی

بەکوڕەکەی خۆی، خەزیمە کوڕی خازم، بۆ ئەبوو موسلیم ڕەوانە کرد.

## گێڕانەوەیەکی دیکە سەبارەت بە ئەبوو موسلیم

سەبارەت بە بەسەرهاتی ئەبوو موسلیم جگە لەوەی ئاماژەمان پێدا، وتراوە، دەڵێن: ئیبراهیمی ڕێبەر، لەکاتی بەڕێکەوتنی ئەبوو موسلیم بۆ خوراسان، کچی باوکی نەجمی کردە هاوسەری ئەو و ماردییەکەی دا و نامەی بۆ سەرکردەکانی بزوتنەوەی بەنی عەباس نووسی تا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن. ئەبوو موسلیم، یەکێك لەخەڵکانی خوتەرنییەی سوادی کوفە بوو. پاڵەوانی ئیدریس کوڕی مەعقەلی عیجلی بوو. بەڵام دواتر هاوڕێیەتی و گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ محەممەد کوڕی عەلی و دواتر بۆ کوڕەکەی، ئیبراهیم کوڕی محەممەد، دەربڕی. لەتەمەنی نەوجەوانیدا هاتە خوراسان. سلێمان بەو ڕازی نەبوو چوونکە دەترسا هێزی هەڵسورانی کاروبارەکانی نەبێت. لەبەر ئەمە ئەوی بۆ لای ئیبراهیم، گەڕاندەوە.

باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیم، ئامادە نەبوو و لەپشتەوەی ڕووباری بەلخ، ژیانی بەسەر دەبرد. کاتێك بۆ مەرو گەڕایەوە، نامەی ئیبراهیمی ڕێبەریان بۆ خوێندەوە. سەبارەت بە ئەبوو موسلیم پرسیاری کرد و پێیان وت سلێمان کوڕی کەسیر، ئەوی گەڕاندۆتەوە. سەرکردەکانی کۆکردەوە و پێی وتن: نامەی ڕێبەرتان بەدەست گەیشت و فەرمانی پێداون بۆ سەرکردایەتی و سەرپەرەستی کردنی ئێوە، چ کەسێکی هەڵبژاردوە، بەڵام ئێوە، ئەوتان گەڕاندەوە. چ بەڵگە و پاساوێکتان هەیە؟ سلێمان وتی: گەنج بوو و ترسام نەتوانێت، ڕێبەرایەتی ئێمە لەئەستۆ بگرێت. بۆ خۆم و ئەو خەڵکانە دەترسام کە بەبانگەوازەکەی ئێمە ڕازی بوون. باوکی داوود وتی: ئایا لەناو ئێوەدا کەسێك هەیە باوەڕی نەبێت خواوەند محەممەدی هەڵبژارد و وەك پێغەمبەر(د.خ)، بۆ لای هەموو ئافرێنراوەکانی، ڕەوانەی کرد؟ وتیان: نە. وتی: ئایا باوەڕتان نییە خواوەند نووسراوەکەی بۆ ناردەخوار و حەڵاڵ و حەرام و شتەکانی دیکەی تیا روون کردۆتەوە و لەوەی بووە و دەبێت، ئاگاداری کردۆتەوە؟ وتیان: نە. وتی: ئایا گومان دەکەن خواوەند کاتێك، ئەوی بۆلای خۆی بردەوە کەپەیامی خواوەندی گەیاندبوو؟ وتیان: نە. وتی: ئایا گومان دەکەن، زانستەکەی لەگەڵ خۆی، کۆچی کرد یا دوای ئەو مایەوە؟ وتیان: مایەوە. وتی: ئایا گومان دەکەن لای نزیکترین کەسەکانی بەجێی هێشت؟ وتیان: نە. وتی: ئایا باوەڕتان نییە ئەم بنەماڵەیە سەرچاوەی زانست و میرات هەڵگرانی پێغەمبەری خوان؟ وتیان: باوەڕمان هەیە. وتی: دەبینم ئێوە گومانتان هەیە و گرنگیتان

بەزانستی ئەوان نەدا. ئەگەر نەیاندەزانی ئەم گەنجە، ئەو پیاوەیە دەبێت جڵەوی کارەکان بگرێتەدەست، ئەویان ڕەوانە نەدەکرد.

ئەوان کەسیان بەدوای ئەبوو موسلیم رەوانە و لەقومس، گەڕاندیانەوە و بەپێی وتەکانی باوکی داوود، ئەویان وەك سەرپەرەستی کاروبارەکانی خۆیان هەڵبژارد و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون. لێرەوە بوو ئەبوو موسلیم ڕق و کینەی سلێمان کوڕی کەسیری لەدڵ گرت و بۆ هەمیشە لەدڵیدا مایەوە و لەبیری نەکرد.

ئەو، بانگەشەکەرانی بۆ کەنارەکانی خوراسان ڕەوانە کرد. خەڵکان دەستە دەستە، بەپێشنیارەکانیان رازی و بانگەوازی عەباسییەکان لەسەراسەری خوراسان بڵاو بوویەوە. ئیبراهیمی رێبەر، نامەی بۆ نووسی کە لەساڵی ١٢٩/ ٧٤٧ زایینی لەحەج، چاوی پێی بکەوێت تا فەرمانی خۆی سەبارەت بەئاشکرا کردنی بانگەوازەکە، دەربکات. دەبێت قەحتەبە کوڕی شەبیب لەگەڵ خۆی بێنێت و ئەوەی سامان و دارایی شیعەکانە، تەسلیمی بکات. ئەبوو موسلیم ئەو کارەی کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان و شیعەکان، بەرێکەوت. نامەی ئیبراهیمی پێگەیشت کەفەرمانی پێدەدا بۆ خوراسان بگەڕێتەوە و بانگەوازەکەی خۆی لەوشارە، ئاشکرا بکات. سامانەکانی بەقەحتەبە ڕەوانەو لەسوچ و کەنارەکانی خوراسان چاوەڕوانی گەیشتنی سامانەکانی دەکرد. خالید کوڕی بەرمەك و باوکی ئەعوەنی بانگ کرد. ئەم دووانە سامانی شیعەکانیان پێگەیاند و بۆ بینینی ئیبراهیمی رێبەر، بەرێکەوت.

## کوژرانی کرمانی

پێشتر ئاماژەمان پێدا حارس کوڕی سورەیج، لەسەر دەستی کرمانی کوژرا. کاتێك ئەوی کوشت، دەستی بەسەر مەرودا گرت و نەسر، خۆی لەو شارە بەدوور گرت. نەسر، سالم کوڕی ئەحوزەی لەگەڵ پاسەوانەکان و سوارکارەکان بۆ شەڕی ئەو، ڕەوانە کرد و چاوی بەیەحیا کوڕی نوعەیمی شەیبانی کەوت کە لەگەڵ هەزار شەڕکەر بۆ شەڕ ئامادە بوو. محەممەد کوڕی موسەنا لەگەڵ حەوستەد سوار، لەئەزد، کوڕی حەسەن کوڕی شێخ لەگەڵ هەزار گەنجی شەڕکەر و جورەمی کوڕی سەعد لەگەڵ هەزار گەنجی یەمەنی. سالم بەمحەممەد کوڕی موسەنای وت: ئەی محەممەد، بەم خوێ فرۆشە (شەیبانی) بڵێ تا ڕووبەڕووی ئێمە ببێتەوە. محەممەد وتی: ئەی زادەی ژنی رووسپی، ئەمە سەبارەت بەباوکی عەلی دەڵێیت؟ شەڕێکی قورسیان بینی و موسلیم کوڕی ئەحوەز و سەد لەشەڕکەرانی کوژران. بیست کەس

لەشەرکەرانی کرمانیش، گیانیاندا.

کاتێك سوپاکەی نەسر تێکشکاو بۆ لای ئەو گەڕانەوە، عەسمە کوڕی عەبدوالله ئەسەدی پێی وت: ئەی نەسر، بوویتە هۆکاری شوومی عەرەبەکان! ئێستا کە ئەم کارانەت کردووە، خۆت بۆ شەڕ ئامادە بکە. نەسر، عەسمەی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کرد. عەسمە لەشوێنەکەی سالم وەستا و هاواری کرد: ئەی محەممەد کوڕی موسەنا، بەم زووانە دەزانیت مارماسی، ماسی ناخوات. محەممەد پێی وت: ئەی زادەی ژنی رووسپی، خۆڕاگری بکە. فەرمانی بەمحەممەدی سەعدیدا لەگەڵ خەڵکانی یەمەن، هێرش بکاتە سەریان. شەڕێکی قورسیان کرد و عەسمە شکستی خوارد و بۆ لای نەسر گەڕایەوە. چواسەد کەس لەشەڕکەرانی کوژران.

نەسر، مالك کوڕی عەمرۆ تەمیمی و شەرکەرەکانی ئەوی ڕەوانە کرد و هاواری کرد: ئەی کوڕی موسەنا، بۆ شەڕی من وەرەدەر. کوڕی موسەنا روبەروی بوویەوە و مالك شمشێرێکی لەملیدا بەلاَم کاریگەری دانەنا. محەممەد گورزێکی لەسەریدا و شکاندی. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و سوپاکەی نەسر شکستی خوارد. حەوتسەد کەس لەشەرکەرانی سوپاکەی کوژران و لەشەڕکەرانی کرمانی سێسەد کەس. شەر لەنێوان ئەوان بەردەوام بوو تا ئەوەی پەنایان بۆ سەنگەرەکان برد و دووبارە، شەڕێکی سەخیتان، دەستپێکردەوە.

کاتێك ئەبوو موسلیم زانی هەرکام لەم دوو دەستەیە، ئەوی دیکەی بێزار کردووە و هیچ کەس هاوکاری ئەم دوو سوپایە ناکات، دەستی بەنامە ناردن بۆ شەیبان کرد و بەنێردراوەکەی وت: لەرێگەی موزەرییەکانەوە برۆ چوونکە ئەوان دەستگیرت دەکەن و نامەکەت، لێ دەستێنن. نێردراوەکانیان دەگرت و نامەکانیان دەخوێندەوە. دەیانبینی کەنووسراوە: دەزانم خەڵکانی یەمەن وەفایان بۆ کەس نییە و چاکەیان، لێ ناوەشێتەوە. باوەڕیان پێمەکە و دڵیان پێ مەبەستە، هیوادارم، خواوەند لەناو خەڵکانی یەمەن، موزەرییەکان بکاتە هاورێی تۆ. ئەگەر زیندوو بمێنم، نەیەك تاڵ موو دەخەمە سەر جەستەیان، ئەگۆشت لەژێر نینۆکیان. نامەیەکی دیکەی بەهەمان شێوە دەنووسی و بەهەمان شێوە خراپەی موزەرییەکانی دەهێنایە سەرزمان و بەنێردراوی دەوت تا لەرێگەی خەڵکانی یەمەنەوە بڕوات. لەم کارە بەردەوام بوو تا ئەوەی هەر دوو دەستەکەی خوازیاری پەیوەست بوون، بەخۆی کرد. دواتر نامەی بۆ نەسر کوڕی سەیار و کرمانی نووسی و وتی: رێبەر، فەرمانی پێدوام، چاکەی ئێوەم بوویت و من سەرپێچی فەرمانەکانی ناکەم. نامەی بۆ شارەکان نووسی تا بانگەوازەکەی خۆیان ئاشکرا بکەن. یەکەم کەسان کەرەشیان پۆشی و

ئالأیان بەرز کردەوە، ئەسید کوڕی عەبدوالڵەی خوزاعی لەنەسا، موقاتیل کوڕی حەکیم و کوڕی غەزەوان بوون. هاواریان کرد: یا محەممەد، ئەی سەرکەوتوو! خەڵکانی مەرو، ئەبیوەرد، مەرورود و گوندەکانی مەڕ، ڕەشیان پۆشی.

ئەبوو موسلیم بەرێکەوت تا لەنێوان سەنگەری کرمانی و سەنگەری نەسر، دابەزی. هەردوو لا، ئەویان بەگەورە هەژمار و ڕێزیان گرت. کەسی بۆ لای کرمانی ڕەوانە و پەیامیدا: من لەگەڵ تۆم. کرمانی رازی و ئەبوو موسلیم، پەیوەستی بوو. ئەم کارە بۆ نەسر گران و دژوار بوو. کەسی بۆ لای کرمانی نارد و وتی: هاوار لەتۆ، فریو مەخۆ! سوێند بەخوا لەگیانی خۆت و هاوەڵانت، دەترسم. بۆ ناو مەرو، بگەڕێرەوە تا بێم و پەیمانی ئاشتی لەنێوان خۆماندا، بنووسین. دەیویست بەم کارە جیایی لەنێوان ئەبوو موسلیم و کرمانی دروست بکات. کرمانی بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە و ئەبوو موسلیمی لەناو لەشکرگەکە، بەجێهێشت. کرمانی بەرێکەوت و لەگۆڕەپانی گەورەی شاردا وەستا. سەد سوار، هاورێیەتیان دەکرد و قورتوق لەسەریدا بوو. پەیامی بۆ نەسر نارد: وەرەدەر تا پەیمانی ئاشتی بنووسین. نەسر شوێنی زیان وەرگرتنی کرمانی دۆزییەوە. حارس کوڕی سورەیحی لەگەڵ سێسەد سوار بۆ گۆڕپانی شارەکە، نارد. لەوێ رووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. شمشێرێك بەر کەلەکەی کرمانی کەوت و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. هاوەڵانی، پارێزگاریان لێکرد بەڵام ژمارەیەکی زۆر لەشەڕکەرانی نەسر، هێرشیان کرد و چیتر نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن. نەسر کوڕی سەیار، کرمانی کوشت و لەداریدا. هاورێ لەگەڵ ئەو، سەمکەیشی کوشت.

عەلی کوڕی کرمانی هات کەدەستەیەکی فراوانی لەدەوری خۆی کۆکردبوویەوە. ڕۆشتە لای ئەبوو موسلیم و هاورێیەتی ئەوی هەڵبژارد. ئەوان، لەگەڵ نەسر کوڕی سەیار شەڕیان کرد تا ئەوەی لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی دەریانپەڕاند. نەسر ڕووی کردە ماڵەکانی مەرو. ئەبوو موسلیم بەرەو، مەرو بەرێکەوت. عەلی کوڕی کرمانی ڕۆشتە لای و لەهاورێیەتی خۆی ئاگاداری کردەوە. وەك فەرمانداری سلاوی بۆ نارد و پێی وت: فەرمانەکانی خۆت بفەرموو تا هاورێی تۆ لەکارەکاندا بم و ئەوەی فەرمانی پێدەدەیت، ئەنجامی بدەم. ئەبوو موسلیم وتی: بەمشێوەیە بمێنەرەوە تا فەرمانی خۆم سەبارەت بەتۆ دەربکەم. کاتێك ئەبوو موسلیم لەنێوان سەنگەرەکانی کرمانی و نەسر دابەزی و نەسر هەستی بەبەهێزی ئەو کرد، نامەی بۆ مەروان کوڕی محەممەد نووسی و لەکار و ژیانی ئەبوو موسلیم، ئاگاداری کردەوە. وتی: بزوتنەوەی دەستپێکردووە و شوێنکەوتەی فراوانی هەیە و بۆ فەرمانبەری کردن لەئیبراهیم

کوڕی محەممەد، هانیان دان. هۆنراوەیەکی بۆ نووسی:

اری بین الرماد و میض نار — و اخشی ان یکون له ضرام

فان النار بالعودین تذکی — و ان الحرب مبداها کلام

فقلت من التعصب لیت شعری — ا ایقاظ امیة ام نیام

یانی: لەنێوان خۆڵەمێش، درەوشاوەیی ئاگر دەبینم و دەترسم لەناکاو بڵێسە بسەنێت. ئاگر، بەدوو دار دادەگیرسێت و شەڕ بەچەند وتەیەك. لەسەرسوڕمانەوە وتم: خۆزگە دەمزانی ئومەوییەکان خەوتون یا بێدارن.

مەروان بۆی نووسی: ئەو کەسەی لەبەرابەر و نزیك لەرووداوەکانە، ئەو شتانە دەبینێت کە لەدوورەوە، نابینرێن. برینە چڵکاوییەکەی خۆت بکەرەوە. نەسر وتی: من هاورێی ئێوەم، ئاگادارم کردنەوە کەتوانای ئەم کارەم نییە. نامەی بۆ یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. ئەم هۆنراوەی بۆ نارد:[١]

ابلغ یزید و خیر القول اصدقه — و قد یتقنت ان لاخیر فی الکذب

ان الخراسان ارض قد رأیت بها — بیضا لو افرخ قد حدثت بالعجب

فراخ عامین الا انها کبرت — لما یطرن وقدسر بلن بالزعب

الا تدارك بخیا الله معلمة — الهبن نیران حرب ایما لهب

یانی: یەزید ئاگادار بکەرەوە (باشترین وتارەکان، راستترینیانە وبێ گومان دەزانم کەدرۆ، سوودی نییە) ئاگاداری بکەرەوە خوراسان سەرزەمینێکە پڕ لەتۆو و ئەگەر جوجکە هەڵبێنێت، شتی سەیری زۆری لێ دەبینرێت. جوجکە دووساڵەکان کەگەورە بوون، هێشتا هەڵنەفڕیون و پەڕ و باڵیان پۆشیوە. سوارکارانی رێگەی خوا، بێنەدەر و ئاگرێك کپ بکەرەوە کەبڵێسەی سەندوە.

یەزید وتی: زۆر مەڵێ، چوونکە سوپام نییە.

کاتێك مەروان، نووسراوەکەی نەسری خوێندەوە، گەیشتنی نێردراوی ئەو لەگەڵ گەیشتنی نێردراوی ئەبوو موسلیم بۆ لای ئیبراهیم، لەیەك کاتدا بوو. نێردراو لای ئیبراهیم دەگەڕایەوە و وەڵامی بۆئەبوو موسلیم هەڵگرتبوو: نفرین وسەرکۆنەی دەکرد بۆ لەو دەرفەتە زێرینە کەڵکی وەرنەگرتووە و نەسر و کرمانی نەکوشتووە و لەناوی نەبردوون. فەرمانی پێدان هەموو عەرەب زمانەکانی خوراسان بکوژێت. کاتێك نامەکەی خوێندەوە، بۆ کارگوزارەکەی خۆی لەبەلقا، نامەی نووسی تا بڕواتە حومەیمە و ئیبراهیم کوڕی محەممەد

بگرێت و زنجیر لەدەست وپێ، ڕەوانەی بکات. ئەو کارەی کرد. مەروان، ئەوی خستە زیندانەوە.

## هاوپەیمانی خوراسانییەکان لەگەڵ ئەبوو موسلیم

لەم ساڵەدا، هەموو هۆزە عەرەبییە نیشتەجێکانی خوراسان، بۆ شەڕ کرن لەگەڵ ئەبوو موسلیمی خوراسانی، پەیمانیان بەست. ئەبوو موسلیم، لەلەشکرگەکەی خۆی لەئیسپیدەنگ، بۆ ماخوان، کۆچی کرد.

کاتێك بانگەوازەکەی ئەبوو موسلیم ئاشکرا بوو و خەڵکان لەسووج و کەنارەکانەوە، دەوریان گرت، خەڵکانی مەرو، هاتوچۆ کردن بۆ لای ئەویان دەستپێکرد. نەسر نەرێگەی لێدەگرتن نە هێرشی دەکردنەسەر. کرمانی و شەیبان لەکارەکانی ئەبوو موسلیم نیگەران نەبوون چوونکە شوێنکەوتەکانی خۆی بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی مەروان، هاندەدا. ئەبوو موسلیم لەخێوەتێکدا بوو بێ پاسەوان و بێ دەرگاوان. لەناو خەڵکاندا بەهێزبوو. وتیان: پیاوێك لەبەنی هاشم دەرکەوتووە کەخۆڕاگری و ئاسوودەیی لەگەڵدایە. چەند گەنجێك لەباوەڕدارانی مەرو، بەمەبەستی فێربوونی زانستە دینییەکان، ڕۆشتنە لای ئەبوو موسلیم و سەبارەت بەنەژادی ئەو پرسیاریان کرد. وتی: چاکەی من لەگەڵ ئێوە باشتر لەنەژدای منە. سەبارەت بەفێقە و شەرعی ئیسلام پرسیاریان کرد، وتی: ئەگەر پێشنیاری چاکە بەخەڵکان بکەن و لەخراپە دووریان بخەنەوە، باشتر لەم پرسیارانەیە، ئێمە پێویستمان بەهاوکاری ئێوەیە نەك پرسیارەکانتان، داوای لێبووردن دەکەین. وتیان: تۆ کەسێکی خاوەن نەژاد نیت و گومانمان نییە کەبەزوویی دەکوژرێیت. تەنیا ئەوندە بەسە یەکێك لەم دوو فەرمانداره مەبەستی لەناو بردنی تۆ بکات. ئەبوو موسلیم وتی: بەخواستی خواوەند، هەردووکیان دەکوژم. ڕۆشتنە لای نەسر و ئاگاداریان کردەوە. وتی: خوا پاداشتی چاکەتان بداتەوە، کەسانێکی وەك ئێوە دەتوانن بەدواییدا بگەڕێن و بیناسنەوە. ڕۆشتنە لای شەیبان و ئاگاداریان کردەوە. نەسر پەیامی بۆ نارد: من و تۆ یەکترمان بێزار وشەکەت کردووە، دەست لەشەڕ کردن لەگەڵ من هەڵبگرە تا شەڕ لەگەڵ ئەبوو موسلیم، بکەم. ئەگەر دەتەوێت، من پەیوەستی سوپاکەی خۆت بکە تا بیکوژم یا بۆ ئەو شوێنەی لێیهاتووە، دووری بخەمەوە. دواتر لەو شوێنە بگەڕێمەوە کەپێکەوە بووین. شەیبان دەیویست ئەو کارە بکات. ئەم هەواڵە بە ئەبوو موسلیم گەیشت و نامەی بۆ عەلی کرمانی نوسی: تۆ داغداریت و

باوکت کوژراوە و ئێمە دەزانین هاورێی شەیبان نیت و تەنیا لەبەر ئەوە شەڕ دەکەیت تا تۆڵەی خوێنی باوکت، بستێنیتەوە. شەیبان بەئاشتی کردن لەگەڵ نەسر، رازی نەبوو. عەلی رۆشتە لای شەیبان و لەبۆچوونی خۆی ئاگاداری کردەوە. نەسر پەیامی بۆ شەیبان نارد: تۆ فریودراویت. سوێند بەخوا ئەم کارە بەرادەیەك گەورە دەبێت کەهەر گەورەیەك بەبچوك بزانیت. هۆنراوەیەکی خوێند و رووی دەمی کردە رەبیعە و خەڵکانی یەمەن و ئەوانی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەبوو موسلیم هاندا:

| | |
|---|---|
| ابلغ ربيعة في مرو و في يمن | ان اغضبووا قبل ان لا ينفع الغضب |
| مابا لكم تنشبوون الحرب بينكم | كان اهل الحجى عن رايكم غيب |
| و تتركون عدوا قد احاط بكم | ممن تأشب لادين ولا حسب |
| لا عرب مثلكم في الناس نعرفهم | و لا صريح موال ان هم نسبووا |
| من كان يسألني عن اصل دينهم | فان دينهم ان تهلك العرب |
| قوم يقولون قوما ما سمعت به | عن النبي و لا جاءت به الكتب |

یانی: بەخەڵکانی رەبیعە لەیەمەن و مەرو پەیام بگەیێنە و بڵێ: تورە ببن پێش ئەوەی تورە بوون، سوودی نەبێت. ئێوە چیتان بەسەر دێت کە بەوشێوە، ئاگری شەڕ لەناو خۆتانا دادەگیرسێنن؟ دەڵێی بیرمەندەکان لەناو ئێوەدا نەماون. دوژمن پشتگوێ دەخەن کە لەچوارلاوە گەمارۆی داون، کەسانێك پشتگوێ دەخەن کە لەسووچ و کەنارەکانەوە هاتوون، نەئایینیان هەیە و نەنەژادێکی راستەقینە. نەعەرەب نەژادێك لەناو ئەواندا، وەك ئێوە دەبینم نەیەك رەگەیەك کەنەژادی خۆی ئاشکرا بکات. هەرکەس سەبارەت بەبنچینەی ئایینی ئەوان لەمن بپرسێت، دەڵێم: بنەمایی دینەکەیان ئەوەیە لەگەڵ یەك پەیمان ببەستن و بنچینەی عەرەبەکان لەرەگ و ریشەوە دەرهێنن. خەڵکانێکن، قسەی جۆراوجۆر دەهێننە سەرزمان، ئەو وتانەی نە لەپێغەمبەرم بیستوە نە لەناو نوسراوی خواوەندا، بینیومە.

بەمشێوەیە سەرقاڵ بوون. ئەبوموسلیم، نەزر کوڕی نوعەیمی زەببی بۆ هەرات نارد کەفەرماندارەکەی عیسا کوڕی عەقیلی لەیسی بوو. ئەوی لەوێ دەرپەڕاند و عیسا تێکشکاو، بۆ لای نەسر گەڕایەوە و نەزر، دەستی بەسەر هەراتدا گرت.

یەحیا کوڕی نوعەیم کوڕی هوبەیرەی شەیبانی بەکوڕی کرمانی و شەیبانی وت: یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرن: یا پێش موزەرییەکان لەناو دەچن یا ئەوان پێش ئێوە. وتیان: ئەمە چۆنە؟ وتی: ئەبوموسلیم، یەك مانگ پێشتر بانگەوازەکەی خۆی ئاشکرا کردووە و سوپاکەی

ئەو، ئێستا بەئەندازەی سوپاکەی ئێوەیە. وتیان: چارە چییە؟ وتی: پەیمانی ئاشتی لەگەڵ نەسر ببەستن و ئەگەر ڕێگەی سازگاری لەگەڵ ئەو بگرنەبەر، شەڕ لەگەڵ نەسر دەکەن و ئێوە پشتگوێ دەخەن چوونکە کارەکان لەدەست موزەرییەکاندایە. ئەگەر پەیمانی ئاشتی لەگەڵ نەسر نەبەستن، ئەوان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەبوموسلیم دەبەستن و شەڕ لەگەڵ ئێوە تاقیدەکەنەوە. خەڵکانی موزەر، پێش بخەن تا چاوتان بەکوژرانی ئەوان ڕووناك ببێتەوە.

شەیبان کەسی بۆ لای نەسر ڕەوانە و پێشنیاری ئاگربڕی کرد. نەسر ڕازی و سالم کوڕی ئەحوزەی بەپەیمانی ئاشتییەوە نارد. ڕۆشتە لای شەیبان و بینی کوڕی کرمانی و یەحیا کوڕی نوعەیم، لای ئەو دانیشتوون. سالم بەکوڕی کرمانی وت: ئەی پیاوی یەکچاو، شیاوی ئەم پێشگووییەیت ئەو یەکچاوە بیت کەدەڵێن: لەناوچوونی موزەرییەکان لەسەر دەستی ئەوە. دواتر پەیمانی ئاگربڕیان نووسی و بۆ ماوەی یەك ساڵ ڕێزیان لێگرت.

هەواڵی ئەم کارە بە ئەبوموسلیم گەیشت. نامەی بۆ شەیبان نووسی: ئێمە چەند مانگێك شەڕ لەگەڵ تۆ ناکەین، بۆ ماوەی سێ مانگ دەست لەشەڕ کردن هەڵگرە. کوڕی کرمانی وتی: من لەگەڵ نەسر پەیمانی ئاشتیم مۆر نەکردووە، شەیبان ئەو کارەی کرد و من پێی، ڕازی نەبووم. من باوك کوژراوم و بکوژەکەی، هیچ کات لەبیر ناکەم. سەر لەنوێ شەڕی دەستپێکردووە بەڵام شەیبان هاوکاری نەکرد و وتی: شیاوە نییە پەیمان بشکێنم و باوەڕم بەفرت و فێڵ نییە.

کوڕی کرمانی پەیك و پەیامی بۆ ئەبوموسلیم ڕەوانە و داوای هاوکاری لێکرد. ئەبوموسلیم بەڕێکەوت و لەماخوان دابەزی. مانەوەی ئەو لەئیسپیدەنگ، ٤٢ ڕۆژی خایاند. سەنگەری هەڵکەند و ئوردوی لێدا. کاتێك لەئیسپیدەنگ، دابەزی، سەنگەری دروست کرد و دوو دەرگای بۆ دانا. باوکی نەسر مالك کوڕی هەیسەمی کردە فەرماندەی پاسەوانەکان، باوکی ئیسحاق ناسراو بەناوی خالید کوڕی عوسمانی کردە فەرماندەی شەرکەران، باوکی ساڵح کامیل کوڕی موزەفەری وەك سەرپەرەستی دەبیرخانەی سوپاکەی دەستنیشان کرد و قاسم کوڕی موجاشعی نەقیبی کرد سەرپەرەستی دامەزراوەی داد. قاسم لەپشت سەری ئەبوموسلیم، نوێژی دەخوێند و دوای نوێژی ئێوارێ، داستانی بۆ خەڵکان دەگێڕایەوە و ئاماژەی بەلەپێشی بنەماڵەی هاشم و خراپەکاری ئومەوییەکان، دەدا.

کاتێك ئەبوموسلیم لەماخوان دابەزی، پەیامی بۆ کوڕی کرمانی نارد: من هاوپەیمانی تۆ

لەبەرابەر نەسرم. کوڕی کرمانی وتی: حەز دەکەم ئەبوموسلیم سەردانم بکات. ئەبوموسلیم ڕۆشتە لای و بۆ ماوەی دوو ڕۆژ، مایەوە. ئەم سەردانە، پێنج ڕۆژی یەکەمی مانگی موحەرەمی ١٣٠/ ١٥ سێپتامبەری ٧٤٧ زایینی، ڕوویدا.

یەکەم کارگوزار کەئەبوموسلیم دەستنیشانی کرد، داوود کوڕی کەرار بوو. ئەو کۆیلەکانی گەڕاندەوە و سەنگەرێکی لەگوندی شەوال بۆ هەڵکەندن و سەرپەرەستی سەنگەرەکەی بەداوود کوڕی کەرار، سپارد. کاتێك ژمارەیەکی زۆر لەکۆیلەکان لەدەوری کۆبوونەوە، فەرماندەیی ئەوانی بۆ ئەبیوەرد بۆ لای موسا کوڕی کەعب ڕەوانە کرد.

ئەبوموسلیم فەرمانی بەکامیل کوڕی موزەفەردا، بەناو سوپاکەدا بگەرێت و ناوی ئەوان و باوکان و پێشینان و شوێنی لەدایك بوونیان بنووسێت و لەناو دەفتەرێك، تۆماری بکات. ژمارەیان شەش هەزار شەڕکەر بوو.

هۆزەکانی موزەر و یەمەن و ڕەبیعە بۆ دەست هەڵگرتن لەشەڕ پەیمانیان بەست و بڕیاریاندا لەگەڵ ئەبوموسلیم، شەڕ بکەن. ئەبوموسلیم ئاگادار بوویەوە و ئەم ڕووداوەی بەگەورە و دژوار زانی. بەناو لەشکرگەکەیدا گەڕا و بینی کەماخوان، لەخوارەوەی ئاوەکە، جێگیرە، ترسا نەسر، ڕێگەی ئاوەکەی لێ بگرێت و لەبەر ئەمە بۆ لەشکرگەی، بۆ ئالین، گواستەوە. مانەوەی لەماخوان، چوار مانگی خایاند. لەئالین دابەزی و سەنگەری هەڵکەند.

نەسر کوڕی سەیار لەکەنارەکانی ڕووباری عەییاز، ئوردوی لێدا و عاسم کوڕی عومەری لەبەلاشگەرد و باوکی زەییالی لەتوسان جێگیر کرد. باوکی زەییال سوپاکەی لەناو ماڵی خەڵکی توسان، دابەزاند. زۆرینەی خەڵکەکەی لەناو سوپاکەی ئەبوموسلیمدا بوون. ئەوان، خەڵکی توسانیان ئازار و ستەمیان لێکردن. ئەبوموسلیم، سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد کە لەگەڵ ئەبوو زەییال و سوپاکەی شەڕیان کرد. نزیکەی سی شەڕکەر لەسوپاکەی باوکی زەییالیان ئەسیر کرد. ئەبوموسلیم جل و بەرگی لەبەر کردن و بریندارەکانی تیمار و دواتر ئازادی کردن.

کاتێك لەشکرگەکەی ئەبوموسلیم بەهێز و لەباشترین شوێنی ئالین جێگەی گرت، فەرمانی بەموحریز کوڕی ئیبراهیمدا لەگەڵ دەستەیەك بەرێکەوێت و لەجیرەنگ، ئوردو لێبدات و شیعەکان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە تا ڕەگ و ریشەی نەسر کوڕی سەیار، لەمەرورود، هەڵکەنێت و بەلخ و تەخارستان لەژێر دەسەڵاتی ئەو دەربێنێت. موحریز ئەو کارەی کرد. نزیکەی هەزار پیاوی شەڕکەر، لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو، ڕێگەی هەموو

پێداویستییەکانی لەئەسر گرت.

## زاڵبوونی عەبدواللە کوڕی معاویە لەفارس و کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا، عەبدواللە کوڕی معاویە کوڕی عەبدواللە کوڕی جەعفەر، دەستی بەسەر فارس و شارەکانیدا گرت. پێشتر ئاماژەمان پێدا کەڕۆشتە کوفە و ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە بەڵام شکستی خوارد و لەکوفەوە، بۆ مەداین، هەڵات.

کاتێك گەیشتە مەداین، دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە و کەسانیتر، لەدەوری کۆبوونەوە. بەرەو کوێستانەکان بەرێکەوت و دەستی بەسەردا گرت و حیلوان و کومس و ئیسفەهان و رەی، هێنایە ژێر فەرمانی خۆیەوە. کۆیلەکانی کوفە لەدەوری کۆبوونەوە و لەئیسفەهان نیشتەجێ بوو.

محارب کوڕی موسا، موالی بەنی یەشکر، لەولاتی فارس، کەسێکی رێزدار و خاوەن شکۆ بوو. ڕۆشتە کۆشکی فەرمانداری و کارگوزاری کوڕی عومەری دەرپەڕاند و خەڵکان، لەگەڵ عەبدواللە کوڕی معاویە، بەیعەتیان بەست. موحاریب هێرشی کردە سەرکرمان. سەرکردەکانی سوپای شام، پەیوەستی محاریب بوون. هێرشی کردە سەر موسلیم کوڕی موسەییب، کارگوزاری کوڕی عومەر لەشیراز و لەساڵی ١٢٨/ ٧٤٦ زایینی، ئەوی کوشت و لەناوی برد. دواتر هێرشی کردە سەر ئیسفەهان و عەبدواللە کوڕی معاویە، بەڵام بۆ ئیستەخر پاشەکشێی پێکرد و لەو شارە، نیشتەجێ بوو. خەڵك لەهاشمییەکان و کەسانی دیکە، لەدەوری کۆبوونەوە و دەستی بەکۆکردنەوەی باج و دانانی کارگوزارەکان کرد. مەنسور کوڕی جمهور و سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك پەیوەستی بوون و شەیبان کوڕی عەبدولعەزیزی خارجی، بۆ لای ئەو بەرێکەوت. باوکی جەعفەر مەنسوری(تاك دیناری) و عەبدواللە کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی عەباس و عیسا کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی عەباس، پەیوەستی بوون.

کاتێك کوڕی هوبەیرە گەیشتە عێراق، نوباتە کوڕی حەنزەلەی کەلابی بۆ لای عەبدواللە کوڕی معاویە ڕەوانە کرد. سلێمان کوڕی حەبیبیان ئاگادار کردەوە کەکوڕی هوبەیرە، نوباتەی وەك فەرمانداری ئەهواز، دەستنیشان کردووە. ئەو، داوود کوڕی حاتەمی ڕەوانە کرد و لەکەرخ دینار مایەوە تا رێگەی ڕۆشتنی نوباتە بۆ ئەهواز، ببەستێت. شەڕی لەگەڵ کرد و داوود کوژرا و سلێمان لەئەهوازەوە بۆ شاپوور، هەڵات و بینی کوردەکان

دەستیان بەسەر ئەو شارەدا گرتووە. سلێمان شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و لەشاپووری دووریخستنەوە و نامەی بۆ معاویە نووسی و لەبەیعەتی خۆی، ئاگاداری کردەوە.

موحاریب کوڕی موسای یەشکری ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ کوڕی معاویە گرتەبەر و دەستەیەکی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەرشاپوور. یەزید کوڕی معاویە برای عەبدوالله کوڕی معاویە، ڕووبەڕووی بوویەوە و موحاریب شکستی خوارد و ڕووی کردە کرمان و لەوێ مایەوە تا محەممەد کوڕی ئەشعەس هات. موحاریب پەیوەستی بوو. دواتر ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ کوڕی ئەشعەس گرتەبەر. کوڕی ئەشعەس، خۆی و هەر چواردە کوڕەکەی، سەربڕی. عەبدوالله کوڕی معاویە لەئیستەخر بوو تا کوڕی زوبارە لەگەڵ داوود کوڕی یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە، ڕۆشتنە لای. هەروەها کوڕی هوبەیرە، مەعن کوڕی زایدەی لەڕێگەیەکی دیکەوە ڕەوانە کرد. مەعن لەشازان، شەڕی لەگەڵ ئەوان ئەزموون کرد. مەعن وتی:

لیس امیر القدم بالخب الخدع فر من الموت و فی الموت وقع

یانی: سەرودری ئەم خەڵکە، فرەزانێکی بیرمەند نییە، لەمەرگ هەڵات بەڵام مەرگ، تەپوتۆزی لەژیانی هەستاند.

عەبدوالله کوڕی معاویە شکستی خوارد و مەعن، دەستی لێهەڵگرتن. لەگۆڕەپانی شەڕ، پیاوێکی دیکە لەبنەماڵەی ئەبوولەهەب کوژرا. لەو ڕۆژانەدا دەوترا پیاوێك لەهاشمییەکان لەمەرورود دەکوژرێت. خەڵکانێکی زۆریان ئەسیر کرد و کوڕی زوبارە، دەستەیەکی فراوانی لەوان کوشت. مەنسور کوڕی جمهور بۆ هیند هەڵات، عەبدولرەحمان کوڕی یەزید بۆ عەممان، عەمرۆ کوڕی سەهل کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی مەروان بۆ میسر. دیلە نەکوژراوەکانی بۆ لای کوڕی هوبەیرە نارد و ئەویش، ئازادی کردن. کوڕی معاویە ڕووی کردە خوراسان و مەعن کوڕی زایدە بەدوای مەنسور کوڕی جمهور بەرێکەوت بەڵام ئەوی نەدۆزییەوە و گەڕایەوە.

هاورێ لەگەڵ کوڕی معاویە، لەخەواریج و دەستەیەکی فراوان لەخەڵکان، کەسانێکی زۆر دەبینران کەلەوان، چل هەزار کەسیان ئەسیر کرد. یەکێك لەوان عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس بوو. کوڕی زوبارە ئیهانەی کرد و وتی: تۆدەزانی کوڕی معاویە لەگەڵ سەروەری باوەڕداران، ڕێگەی ناسازگاری گرتۆتەبەر، چ هۆکارێك بۆ هاوکاری کردنی ئەو، هانیدایت؟ وتی: قەرزێك لەئەستۆمدا بوو کەگەڕاندمەوە. حەرب کوڕی قەتەنی هیلالی،

نێوەنجیگەری کرد و وتی: خوشکەزای ئێمەیە. کوڕی زوبارە، ئازادی کرد.

عەبدوالله کوڕی عەلی، سەرکۆنەی عەبدوالله کوڕی معاویەی کرد و هاوەڵانی ئەوی بەلوسکە و پوسکە، ناوبرد. کوڕی زوبارە ئەوی بۆ لای کوڕی هوبەیرە نارد کە لەکاردکانی کوڕی معاویە، ئاگاداری کردەوە. ئەو بەدوای عەبدوالله کوڕی معاویە، رووی کردە شیراز و گەمارۆی خستەسەر. عەبدوالله کوڕی معاویە، بەشێوەی کەسێکی هەڵاتوو، لەشارەکە هاتەدەر و دوو براکەی حەسەن کوڕی معاویە کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر و یەزید کوڕی معاویە کوڕی عەبدوالله و دەستەیەك لەهاوەڵانی، هاورێیەتیان دەکرد. رێگەی بیابانی گرتەبەر و لای کرمان تێپەڕی و بەرەو خوراسان بەرێکەوت بەو هیوای ئەبوموسلیم، گوێرایەڵی فەرمانەکانی بێت چوونکە ئەو، پێشنیاری شوێنکەوتنی بنەماڵەی محەممەدی، بەخەڵکان دەکرد و دەستی بەسەر خوراسان، گرتبوو ((بەلام نەیدەزانی ئەبوموسلیم، ملکەچی خۆی بۆ عەباسییەکان دەربڕیوە) لەهەرات نزیك کەوتەوە کەفەرماندارەکەی مالیك کوڕی هەیسەمی خوازعی بوو. کەسی بۆ لای کوڕی معاویە نارد و پرسی: بەچ مەبەستێك رووی لەو دیارە کردووە. وتی: بیستوومە ئێوە خەڵکان بۆ شوێنکەوتن و فەرمانبەری بنەماڵەی محەممەد، هاندەدەن، لەبەر ئەوە، رووم کردە ئەم دیارە. مالیك پەیامی بۆ نارد: نەژادی خۆت بڵێ تا بتناسینەوە. ئەو نەژادی خۆی باس کرد. مالك پێی وت: عەبدوالله و جەعفەر، لەناوەکانی پێغەمبەری خوایە، بەلام معاویە لەناو ئەواندا، پێشینەی نییە. وتی: کاتێك باوکم چاوی بەدنیا هەڵهێنا، باوەگەورێم لای معاویە بوو. داوای لێکرد کورەکەی بەناوی خۆیەوە (معاویە) ناو بنێت و ئەویش، ئەو کارەی کرد و معاویە، سەد هەزار درەمی بۆ نارد. مالك پەیامی بۆ نارد: ئەم یادگاری و ناوەزراوەتان بەبەهایەکی کەم کڕییەوە و بەمشێوەیە لای ئێمە، هیچ پێگەیەکتان نییە. کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم نارد و ئاگاداری کردەوە. ئەبوموسلیم فەرمانی پێدا خۆی و هاوەڵانی دەستگیر و زیندانی بکات. دواتر نامەی ئەبوموسلیمی پێگەیشت کەفەرمانی دەدا حەسەن و یەزید کوڕی معاویە ئازاد بکات و عەبدوالله کوڕی معاویە، بکوژێت. فەرمانی بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆیدا کەباڵشت یا راخەرێکیان خستە سەرسەری و ئەوەندەیان زەخت لێکرد تا گیانی سپارد. دواتر دەریانهێنا و نوێژیان لەسەر خوێند و بەخاکیان سپارد. گۆڕەکەی ئەو لەهەرات، بەناوبانگە و خەڵکان، سەردانی دەکەن.

## باوکی حەمزەی خارجی ( خوازیاری راستی و دروستی )

لەم ساڵەدا، بەلج کوڕی عوقبەبەی ئەزدی خارجی و باوکی حەمزە، لەحەجەوە لەلایەن عەبدوالله کوڕی یەحیای حەزرەمی (خوازیاری راستی) بۆ شەڕ کردن لەگەڵ مەروان کوڕی محەممەد و بەهەڵگرتنی دروشمی خەواریج (داوەری کردن تایبەت بەخواوەند) بەڕێکەوتن. لەو کاتەی خەڵکان لەعەرەفە بوون، نەکەوتبوونە خۆیان کەبینیان ئاڵا و دەستارە ڕەشەکان، بەنووکی ڕمەکانەوە کراوە. ژمارەیان حەوتسەد کەس دەبوو. کاتێك خەڵك ئەوانیان بینی، پرسیاریان کرد. خەڵکانیان ئاگادار کردەوە کە بۆ شەڕ لەگەڵ مەروان و مەروانییەکان هاتوون. عەبدولواحید کوڕی سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك، نامەی بۆ ئەوان نووسی. ئەو، فەرمانداری مەککە و مەدینە بوو و داوای لێکردن ڕێز لەئاشتی و ئاسایشی خەڵکان بگرن. وتیان: ئارەزوومەندی حەج کردنی و بۆ ئەو مەبەستە پشتگەرمین. بەمشێوەیە ئاشتی لەگەڵ کردن کەلەیەك ئاسوودە و لەئەماندا بن تا ئەو کاتەی خەڵکان، دوایین ئایینەکانی حەج ئەنجام دەدەن. ئەوان بەشێوەیەکی جیا، لەعەرەفە مانەوە.

عەبدولواحید خەڵکانی بەڕێخست و لەمەنی لەکۆشکی فەرمانداری مایەوە و باوکی حەمزە لەقرن ثعالب (شاخی ئاسکەکان) دابەزی. عەبدولواحید ئەم کەسانی بۆ لای باوکی حەمزە نارد: عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی، محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمان، عەبدولرەحمان کوڕی قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر، عوبەیدالله کوڕی عومەر کوڕی حەفس کوڕی عاسم کوڕی عومەر کوڕی خەتاب، رەبیعە کوڕی ئەبی عەبدولرەحمان لەگەڵ کەسانێکی هاوشێوەی ئەوان. ئەوان، ڕۆشتنە لای باوکی حەمزە و بینیان کراس و پانتۆڵی کەرباسی لەبەردایە. عەبدوالله کوڕی حەسەن و محەممەد کوڕی عەبدوالله، ئەوانیان بردە لای باوکی حەمزە. وتی: نەژادی خۆتان بڵێن. ئەوان باسیان کرد. باوکی حەمزە، ڕووی گرژ و نارەزامەندی خۆی نیشاندا و دواتر لە عەبدولرەحمان کوڕی قاسم کوڕی عوبەیدالله کوڕی عومەری پرسی و ئەم دووانە نەژادی خۆیانیان باس کرد. بەرووی ئەودووانەدا پێکەنی و ڕووی خۆشی نیشاندا، وتی: سوێند بەخوا مەبەستی شۆڕشم نییە تەنیا لەبەر ئەوەی هاوشێوەی باوکانی ئێوە هەڵسوکەوت بکەم. عەبدوالله کوڕی حەسەن پێی وت: سوێند بەخوا لەبەر ئەوە نەهاتین بۆ لای تۆ جیاوازی لەنێوان باوکانی ئێمە دابنێیت، فەرماندار پەیامی بەئێمەدا ڕەوانە کردووە کەرەبیعە، تۆی لێ ئاگادار دەکاتەوە. کاتێك پەیمانی شکێنی بیرخستەوە، باوکی حەمزە وتی:

پەنا بۆ خوا دەبەم ئەگەر پەیمان بشکێنم یا رێزی نەگرم. سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم تەنانەت ئەگەر بمکوژن. ئەوەی لێی دڵنیایین ئەوەیە کە، ئێمە دەمێنینەوە تا ئەو کاتەی وادەی پەیمانی ئاشتییەکە کۆتایی دێت. ئەوان بۆ لای عەبدولواحید گەڕانەوە و لەپەیامەکەی باوکی حەمزە ئاگاداریان کردەوە. کاتێك یەکەم بەرێکەوتنی خەڵکان دەستی پێکرد، عەبدولواحید بەرێکەوت و مەککەی چۆڵ کرد. باوکی حەمزە، بێ شەڕ، ڕۆشتە ناو شارەکە. یەکێك لەخەڵکان سەبارەت بەعەبدولواحید وتی:

زار الحجيج عصابة قد خالفوا دين الا له ففر عبدالواحد

ترك الحلائل و الامارة هاربا و مضى يخبط كالبعير الشارد

یانی: حەجکەران، چاویان بەدەستەیەك کەوت کە لەگەڵ ئایینی خواوەند، ناسازگار بوون و عەبدولواحید، هەڵات. ژنانی ناو پەردە و کۆشکە ڕەنگینەکەی بەجێهێشت و ڕێگەی هەڵاتنی گرتەبەر و هاوشێوەی وشتری کوێری ڕم کردوو، دەستی بەهەڵبەز و دابەز کرد.

عەبدولواحید بەرێکەوت و لەمەدینە دابەزی. سوپایەکی لەخەڵکی مەدینە کۆکردەوە و بەخششەکانی ئەوانی دە دە زیاد کرد و عەبدولعەزیز کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمانی وەك فەرماندەی ئەوان دیاریکرد. ئەوان بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتە حەڕە، قوربانییەکانیان بینی و درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا.

## فەرمانداری یوسف کوڕی عەبدولڕەحمانی فیهری لەئاندۆلوس

لەم ساڵەدا سەوابە کوڕی سەلامە، فەرمانداری ئاندۆلوس، مرد. بۆ ماوەی دوو ساڵ و چەند مانگ، فەرمانڕەوایەتی کرد. کاتێك مرد، خەڵکان، گرفتاری چەند بەرەکی وناسازگاری بوون. موزەرییەکان هەوڵیاندەدا فەرماندار لەخۆیان بێت و یەمانییەکانیش بەهەمان شێوە. ماوەیەك بێ فەرماندار مانەوە و سومەیل ترسا، ئاژاوە سەر هەڵبدات. پێشنیاری کرد فەرماندار یەکێك لەقورەیشییەکان بێت. هەمووان رازی بوون و ئەو یوسف کوڕی عەبدولڕەحمانی فیهری هەڵبژارد کە لەو کاتەدا لەبیرە بوو. نامەیان بۆ نووسی و ئاگاداریان کردەوە کەخەڵکان وەك فەرمانداری خۆیان، هەڵیانبژاردوە. رازی بوو. پێیان وت: ئەگەر رازی نەبیت، ئاژاوە سەر هەڵدەدات و گوناحەکەی لەئەستۆی تۆدا دەبێت. لەم کاتەدا رازی و رووی کردە قەرتەبە و دەستی بەسەردا گرت و خەڵکەکەی، بەفەرمانڕەوایەتی ئەو، رازی بوون.

کاتێك هەواڵی مەرگی سەوابە و فەرمانداری یوسف بە باوکی خەتار گەیشت، وتی: سومەیل دەیەوێت، فەرمانڕەوایەتی بکەوێتە دەست موزەرییەکان. لەناو خەڵکان دەستی بەئاژاوگێری کرد و ئاژاوە، سەریهەڵدا و موزەرییەکان و یەمانییەکان کەوتنە گیانی یەك.

یوسف کاتێك ئەمەی بینی، لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی هاتەدەر و رووی کردە قەرتەبە وبۆماڵەکەی خۆی گەڕایەوە. باوکی خەتار، ڕۆشتە شەکندە و یەمانییەکان لەدەوری کەڵەکە بوون. موزەرییەکانیش دەوری سومەیلیان گرت. بۆ هێرش کردن سەریەك، پێشڕەویان دەسپێکرد و بۆرۆژگارێکی درێژجەنگان. دژوارتر لەو شەڕانە لەئاندۆلۆس نەبینراوە. شەڕ بەشکستی خەڵکانی یەمەن کۆتایی هات و باوکی خەتار هەڵات و لەئاشێکی سومەیل خۆی شاردەوە. چەند کەسێك سومەیلیان لەشوێنی خۆشاردنەوەی ئەو ئاگادار کردەوە. سومەیل ئەوی گرت و کوشتی و یوسف کوڕی عەبدولرەحمان بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایەتی گەڕایەوە. شکۆ و گەورەیی سومەیل زیادی کرد بەشێوەیەك، فەرمانڕەوایەتی ناوەکەی بۆ یوسف و کاروبارەکان لەسەر دەستی سومەیل، هەڵدەسووڕا.

کوڕی عەلقەمەی لەخمی لەشاری ئاربوونە دژی یوسف کوڕی عەبدولرەحمان ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە بەڵام زۆری نەخایاند و ئەویان کوشت و سەری بڕاوی ئەویان بردە لای یوسف.

هەروەها پیاوێك بەناوی عوزری بەناو و نیشانی (ئەمان بەخشراو) شۆڕشی کرد. لەبەر ئەوە بەمشێوەیە ناوی دەبەن چوونکە شەڕکەران و هاوەڵانی خۆی لەناو ئەمان بەخشراوەکان، هەڵبژارد. یوسف، عامر کوڕی عەمرۆی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو نارد بەڵام نەیتوانی هیچ کارێك بکات و شکستی خوارد و هەڵات. یوسف کوڕی عەبدولرەحمان خۆی روبەرووی بوویەوە و شکستی پێهێناو کوشتی و لەشکرگەکەی تاڵان کرد.

بەشێوەیەکی دیکەیش، ئەم رووداوەیان گێڕاوەتەوە کە لەکۆتاییەکەیدا یەك ناگرێتەوە. لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ١٣٩/ ٧٥٦ زایینی، لەکاتی رۆشتنی عەبدولرەحمانی ئومەوی بۆ ئاندۆلۆس، دەیگێڕینەوە.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

عەبدولواحید فەرمانداری مەککە و مەدینە، لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان، ئەنجامدا.

یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە، فەرمانداری عێراق، سەپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، حەجاج کوڕی عاسمی موحاربی، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە، عیباد کوڕی مەنسور، فەرمانداری خوراسان، نەسر کوڕی سەیار بوو. ئاشی ئاژاوە و کوژران لەو پانتاییە دەسووڕا بەهەمان شێوە کەپەروانە بەدەوری مۆمدا دەسووڕێت.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: باوکی نەسر سالم، یەحیا کوڕی یەعمەری عەدەوی، لەخوراسان کەرێزمانی زمانی عەرەبەی لەسەر دەستی باوکی ئەسوەدی دوئەلی فێر و یەکێك بوو لەزمان شیرین و زمان پاراوەکان. باوکی زەناد عەبدوالله کوڕی زەکەوان، وەهب کوڕی کەیسان، یەحیا کوڕی ئەبی کەسیری یەمامی کە بەباوکی نەسر بانگیان دەکرد، سەعید کوڕی ئەبی سالح، باوکی ئیسحاقی شەیبانی، حارس کوڕی عەبدولرەحمان، رەقەبە کوڕی مەسقەلەی کوفی، مەنسور کوڕی زادان، موالی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی عەقیلی سەقەفی کەجوولەکە و موسڵمان و ئاگرپەرەست و مەسیحی لەرێ ورەسمی بەخاك سپاردنی ئەو بەشداریان کرد چوونکە هەموان باوەڕیان بەپاکیەتی و شیاوی ئەو هەبوو و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣١/ ٧٤٩ زایینی کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و سی کۆچی (( ٧٤٧- ٧٤٨ زایینی ))

### هاتنی ئەبوموسلیم بۆ مەرو

#### بەیعەتی خەڵکانی مەرو لەگەڵ ئەبوموسلیم

لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع الثانی یا جەمادی الاول/ دێسامبەر ٧٤٧ یا ژانویەی ٧٤٨ زایینی، ئەبوموسلیم، ڕۆشتە ناو شاری مەرو.

چۆنیەتییەکی ئەوەی لەم ساڵەدا کوڕی کرمانی، پەیمانی لەگەڵ بەست. کاتێك کوڕی کرمانی و هاوڕێکانی و هۆزەکانی نیشتەجێی خوراسان لەگەڵ نەسر، بۆ دژایەتی کردنی ئەبوموسلیم، پەیمانیان بەست، ئەم کارەی بەدژوار لەقەڵەمدا و شەڕکەرانی خۆی بەمەبەستی شەڕ کردن، کۆکردەوە. سلێمان کوڕی کەسیر لەبەرابەر کوڕی کرمانی، جێگیر بوو. سلێمان پێی وت: ئەبوموسلیم دەڵێت: نەسر، دوێنێکە باوکی تۆی کوشت، ئایا هەست بەبێگانەیی خۆت لەگەڵ ئەو ناکەیت؟ شەرم ناتگرێت؟ گومانم دەکرد تەنانەت لەیەك مزگەوت لەگەڵ نەسر، نوێژ ناخوێنیت! ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر کوڕی کرمانی دانا و لەبۆچوونەکەی پەشیمان بوویەوە و ئاشتی عەرەبەکانی، بەفیڕۆدا.

کاتێك پەیمانی ئاشتی نێوان ئەوان لەناوچوو، نەسر کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم ڕەوانە و داوای لێکرد لەگەڵ نەسرییەکان، پەیمان ببەستێت. هاوەڵانی کرمانی لەخەڵکانی ڕەبیعە و یەمەن، پەیك و پەیامیان بۆلای ئەبوموسلیم نارد و داوای هاوپەیمانیەتییان کرد. چەندین ڕۆژ بۆ ئەم مەبەستە هاتوچۆیان کرد. ئەبوموسلیم فەرمانیداتا شاندی نوێنەرایەتی خۆیان، ڕەوانە بکەن تا یەکێك لەناو ئەوان هەڵبژێرێت. ئەوکارەیان کرد. ئەبوموسلیم فەرمانی بەشیعەکاندا خەڵکانی یەمەن و ڕەبیعە هەڵبژێرن چوونکە موزەرییەکان، هاوپەیمانی شەیتانن. ئەوان هاوەڵان و کارگوزارانی مەروان و بکوژەکانی یەحیا کوڕی زەیدن.

هەردوو دەستەکە هاتن و دەستی پاڕانەوەیان درێژ کرد. ئەبوموسلیم دانیشت و ئەوانی دانیشاند. وەفدی شیعەکان کەپێکهاتبوو لەحەفتا کەس، ئامادە بوون. بەوانی وت: یەکێك لەم دوو دەستەیە هەڵبژێرن. سلێمان کوڕی کەسیر لەناو شیعەکان هەستا و ئاخاوت. ئەو،

وتاردەرێکی زمان پاراو و لەناو خەڵکدا، بەناوبانگ بوو. سلێمان، کوڕی کرمانی و هاوەڵانی ئەوی هەڵبژارد. دواتر مەنسور کوڕی تەڵحە کوڕی زورەیقی نەقیب هەستا و دووبارە ئەوانی هەڵبژارد. مەرسەد کوڕی شەقیقی سولەمی هەستا و وتی: موزەرییەکان بکوژانی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، هاوەڵانی ئومەوییەکان، شوێنکەوتەکانی مەروان، دەستپەروەردەکانی جەعدی خوێنرێژ و کارگوزارانی ئەوانن و خوێنی ئێمە لەئەستۆی ئەوان و سامانی ئێمە لەماڵەکانی ئەواندیە. نەسر کوڕی سەیار، بەکرێگیراوی مەروانە کەفەرمانەکانی ئەو ئەنجام دەدات و لەسەر تەختی وتاردان دادەنیشێت و بۆ بەرژەوەندی ئەو، لەخوا دەپاڕێتەوە و بەسەروەری باوەڕداران، ناوی دەبات. ئێمە، پەنا بۆ خوای گەورە دەبەین و دڵنیایین نەسر لەسەر رێگەی راست، نییە. ئێمە، عەلی کوڕی کرمانی و هاوەڵانی ئەو هەڵدەبژێرین. ئەو حەفتا پیاوە یەکدەنگ وتیان: وتەی راست ئەوەیە کەمەرسەد، هێنایە سەرزمان. شاندی نوێنەرایەتی نەسر هەستان. نیشانەکانی دڵمردوویی و ریسوایی، بەروخساریانەوە دیار بوو. نوێنەرانی کوڕی کرمانی سەربڵند و رازی هەستان و ئەبوموسلیم، لەبالینەوە بۆ ماخوان گەڕایەوە و فەرمانی بەشیعەکاندا، خانوو و نشینگە، دروست بکەن لەبەر ئەوەی خواوەند، قورسایی هاوپەیمانی عەرەبەکانی لەسەر شانیان هەڵگەرت کە لەزیانی ئەواندا بوو.

عەلی کوڕی کرمانی کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم نارد تا لەیەکێك لەرێگەکانەوە بڕواتە ناو شاری مەرو و خۆیشی، لەرێگەیەکی دیکەوە دەڕواتە ناو شارەکە. ئەبوموسلیم پەیامی بۆ نارد: دڵنیا نیم لەوەی دووبارە لەگەڵ نەسر بۆ دژایەتی کردنی، من پەیمان نەبەستیت. تۆ بڕۆ ناو شارەکە و شەڕ لەگەڵ نەسر و شوێنکەوتەکانی، دەستپێبکە. کرمانی ڕۆشتە ناو شارەکە و ئاگری شەڕی، هەڵگیرساند. ئەبوموسلیم، شیبل کوڕی تەهمانی گەورەی لەگەڵ سوارەکان ڕەوانە کرد کەڕۆشتنە ناو شارەکە. شیبل لەناو کۆشکی خاوەنی بووخارا، دابەزی. کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم نارد و داوای لێکرد ئەویش بڕواتە ناو شارەکە. ئەبوموسلیم لەماخوانەوە بەرێکەوت. فەرماندەی پێشەنگەکانی ئەسید کوڕی عەبدوللە خوازعی بوو. فەرماندەی باڵی راست، مالك کوڕی هەیسەمی خوازعی، فەرماندەی باڵی چەپ قاسم کوڕی موجاشعی تەمیمی. ڕۆشتە ناو شارەکە و بینی هەردوو لای شەڕکەر، روبەرووی یەکبوونەتەوە. فەرمانی پێدان دەست لەشەڕ کردن هەڵبگرن. ئەم ئایەی لەقورئان خوێندەوە: موسا ڕۆشتە ناو شارەکەی ئەوان و لەوێ، دوو پیاوی بینی کە لەگەڵ یەك شەڕیان دەکرد، یەکیان لەشوێنکەوتەکانی و ئەوی دیکەیان، لەدوژمنەکانی. هاورێکەی، دژی

دوژمنەکەی، داوای هاوکاری لێکرد. موسا مشتێکی لێدا و ئەوی کوشت. بەخۆی وت: ئەم کارە، بەهۆی هاندانی شەیتانەوە بوو، چوونکە ئەو دوژمنێکی گومڕاکەرە. (قصص/٢٨/ ١٥).
ئەبوموسلیم بەرەو کۆشکی فەرمانداری بەرێکەوت و پەیامی بۆ هەر دوو لای شەڕکەر نارد تا دەست لەشەڕ کردن هەڵبگرن و بەرەو لەشکرگەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. ئەو کارەیان کرد و مەرو، بەتەواوی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەبوموسلیم. فەرمانیدا تا لەشەڕکەران، بەیعەت وەربگرن. ئەو کەسەی بەیعەتی وەردەگرت، باوکی مەنسور تەڵحە کوڕی رەزیق بوو. ئەو، یەکێك لەنەقیبەکان و بەتەواوی شارەزای کاری هاشمییەکان و خراپەکاری، ئومەوییەکان بوو. نەقیبەکان دوانزە کەس بوون کەمحەممەد کوڕی عەلی ئەوانی لەناو حەفتا پیاو هەڵبژاردبوو و کاتێك لەساڵی ١٠٣ یا ١٠٤/ ٧٢١ یا ٧٢٢ زایینی نێردراوەکەی بۆ خوراسان ڕەوانە کرد، ملکەچی فەرمانەکانی بوون. ئەو، بۆ هەرکام لەوان، تایبەتمەندییەکی جیاوازی لەدادپەروەری و خۆپارێزی، دیاریکردبوو. ئەم کەسانە لەناویاندا بوون: سلێمان کوڕی کەسیر، مالك کوڕی هەیسەم، زیاد کوڕی سالّح، تەڵحە کوڕی رەزیق، عەمرۆ کوڕی ئەعیەن، لەخەڵکانی تەی: قەحتەبە کوڕی شەبیب کوڕی خالید کوڕی مەعدان، لەتەمیمییەکان: باوکی عۆیەیینە موسا کوڕی کەعب، لاهیز کوڕی قورەیز، قاسم کوڕی موجاشیع، ئەسلەم کوڕی سەلام، لەبەکر کوڕی وایل: باوکی داوود کوڕی ئیبراهیمی شەیبانی، باوکی عەلی هیرەوی یا شیبان کوڕی تەهمان لەجیاتی عەمرۆ کوڕی ئەعیەن، عیسا کوڕی کەعب و باوکی نەجم ئیسماعیل کوڕی عیمران لەجیاتی باوکی عەلی هیرەوی خەزووری ئەبوموسلیم. لەناو نەقیبەکان کەسیان باوکی زیندوو نەبوو جگە لەباوکی مەنسور تەڵحە کوڕی رەزیق کوڕی سەعد ( هەمان باوکی زێنەبی خوازعی). ئەو لەشەڕی کوڕی ئەشعەس بەشداری و لەبەرژەوەندی موهەلیب، شەڕی کردبوو. ئەبوموسلیم، لەکاروبارەکان راوێژ و سەبارەت بەجەنگەکان، پرسیاری لێدەکرد.

وتارەکەیان لەکاتی بەیعەت وەرگرتن ئەمە بوو: لەگەڵ ئێوە بەیعەت دەبەستین لەسەر بنەمای نووسراوی خواوەند، شێوازی کردەوەکانی پێغەمبەر(د.خ) و شوێنەکەوتن و رەزامەند بوون بەفەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ). پەیمان و سوێندی خوایی لەسەر شانی ئێوەیە لەگەڵ رزگاری و ئازدای و پیادە رۆشتن بۆ حەج. نابێت رۆژیتان بوویت و چاوی تەماح ببڕنە مەبەستێکی دنیایی تا ئەو کاتەی فەرمانڕەواکانتان، خۆیان ئەم کارە دەستپێبکەن.

وتاردەرێکی زمان پاراو و لەناو خەڵکدا، بەناوبانگ بوو. سلێمان، کوڕی کرمانی و هاوەڵانی ئەوی هەڵبژارد. دواتر مەنسور کوڕی تەڵحە کوڕی زورەیقی نەقیب هەستا و دووبارە ئەوانی هەڵبژارد. مەرسەد کوڕی شەقیقی سولەمی هەستا و وتی: موزەرییەکان بکوژانی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، هاوەڵانی ئومەوییەکان، شوێنکەوتەکانی مەروان، دەستپەروەردەکانی جەعدی خوێنرێژ و کارگوزارانی ئەوانن و خوێنی ئێمە لەئەستۆی ئەوان و سامانی ئێمە لەماڵەکانی ئەواندیە. نەسر کوڕی سەیار، بەکرێگیراوی مەروانە کەفەرمانەکانی ئەو ئەنجام دەدات و لەسەر تەختی وتاردان دادەنیشێت و بۆ بەرژەوەندی ئەو، لەخوا دەپاڕێتەوە و بەسەروەری باوەڕداران، ناوی دەبات. ئێمە، پەنا بۆ خوای گەورە دەبەین و دڵنیایین نەسر لەسەر ڕێگەی راست، نییە. ئێمە، عەلی کوڕی کرمانی و هاوەڵانی ئەو هەڵدەبژێرین. ئەو حەفتا پیاوە یەکدەنگ وتیان: وتەی راست ئەوەیە کەمەرسەد، هێنایە سەرزمان. شاندی نوێنەرایەتی نەسر هەستان. نیشانەکانی دڵمردوویی و ریسوایی، بەروخساریانەوە دیار بوو. نوێنەرانی کوڕی کرمانی سەربڵند و رازی هەستان و ئەبوموسلیم، لەبالینەوە بۆ ماخوان گەڕایەوە و فەرمانی بەشیعەکاندا، خانوو و نشینگە، دروست بکەن لەبەر ئەوەی خواوەند، قورسایی هاوپەیمانی عەرەبەکانی لەسەر شانیان هەڵگەرت کە لەزیانی ئەواندا بوو.

عەلی کوڕی کرمانی کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم نارد تا لەیەکێك لەرێگەکانەوە بڕواتە ناو شاری مەرو و خۆیشی، لەرێگەیەکی دیکەوە دەڕواتە ناو شارەکە. ئەبوموسلیم پەیامی بۆ نارد: دڵنیا نیم لەوەی دووبارە لەگەڵ نەسر بۆ دژایەتی کردنی، من پەیمان نەبەستیت. تۆ بڕۆ ناو شارەکە و شەڕ لەگەڵ نەسر و شوێنکەوتەکانی، دەستپێبکە. کرمانی ڕۆشتە ناو شارەکە و ئاگری شەڕی، هەڵگیرساند. ئەبوموسلیم، شیبل کوڕی تەهمانی گەورەی لەگەڵ سوارەکان ڕەوانە کرد کەڕۆشتنە ناو شارەکە. شیبل لەناو کۆشکی خاوەنی بووخارا، دابەزی. کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم نارد و داوای لێکرد ئەویش بڕواتە ناو شارەکە. ئەبوموسلیم لەماخوانەوە بەرێکەوت. فەرماندەی پێشەنگەکانی ئەسید کوڕی عەبدوللە خوازعی بوو. فەرماندەی باڵی راست، مالك کوڕی هەیسەمی خوازعی، فەرماندەی باڵی چەپ قاسم کوڕی موجاشعی تەمیمی. ڕۆشتە ناو شارەکە و بینی هەردوو لای شەڕکەر، روبەرووی یەکبوونەتەوە. فەرمانی پێدان دەست لەشەڕ کردن هەڵبگرن. ئەم ئایەی لەقورئان خوێندەوە: موسا ڕۆشتە ناو شارەکەی ئەوان و لەوێ، دوو پیاوی بینی کە لەگەڵ یەك شەڕیان دەکرد، یەکیان لەشوێنکەوتەکانی و ئەوی دیکەیان، لەدوژمنەکانی. هاورێکەی، دژی

دوژمنەکەی، داوای هاوکاری لێکرد. موسا مشتێکی لێدا و ئەوی کوشت. بەخۆی وت: ئەم کارە، بەهۆی هاندانی شەیتانەوە بوو، چوونکە ئەو دوژمنێکی گومراکەرە. (قصص/٢٨/ ١٥).
ئەبوموسلیم بەرەو کۆشکی فەرمانداری بەرێکەوت و پەیامی بۆ هەر دوو لای شەرکەر نارد تا دەست لەشەڕ کردن هەڵبگرن و بەرەو لەشکرگەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. ئەو کارەیان کرد و مەرو، بەتەواوی کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەبوموسلیم. فەرمانیدا تا لەشەڕکەران، بەیعەت وەربگرن. ئەو کەسەی بەیعەتی وەردەگرت، باوکی مەنسور تەڵحە کوڕی رەزیق بوو. ئەو، یەکێك لەنەقیبەکان و بەتەواوی شارەزای کاری هاشمییەکان و خراپەکاری، ئومەوییەکان بوو. نەقیبەکان دوانزە کەس بوون کەمحەممەد کوڕی عەلی ئەوانی لەناو حەفتا پیاو هەڵبژاردبوو و کاتێك لەساڵی ١٠٣ یا ١٠٤/ ٧٢١ یا ٧٢٢ زایینی نێردراوەکەی بۆ خوراسان ڕەوانە کرد، ملکەچی فەرمانەکانی بوون. ئەو، بۆ هەرکام لەوان، تایبەتمەندییەکی جیاوازی لەدادپەروەری و خۆپارێزی، دیاریکردبوو. ئەم کەسانە لەناویاندا بوون: سلێمان کوڕی کەسیر، مالك کوڕی هەیسەم، زیاد کوڕی سالح، تەڵحە کوڕی رەزیق، عەمرۆ کوڕی ئەعیەن، لەخەڵکانی تەی: قەحتەبە کوڕی شەبیب کوڕی خالید کوڕی مەعدان، لەتەمیمییەکان: باوکی عۆیەیینە موسا کوڕی کەعب، لاهیز کوڕی قورەیز، قاسم کوڕی موجاشیع، ئەسلەم کوڕی سەلام، لەبەکر کوڕی وایل: باوکی داوود کوڕی ئیبراهیمی شەیبانی، باوکی عەلی هیرەوی یا شیبان کوڕی تەهمان لەجیاتی عەمرۆ کوڕی ئەعیەن، عیسا کوڕی کەعب و باوکی نەجم ئیسماعیل کوڕی عیمران لەجیاتی باوکی عەلی هیرەوی خەزووری ئەبوموسلیم. لەناو نەقیبەکان کەسیان باوکی زیندوو نەبوو جگە لەباوکی مەنسور تەڵحە کوڕی رەزیق کوڕی سەعد ( هەمان باوکی زێنەبی خوازعی). ئەو لەشەڕی کوڕی ئەشعەس بەشداری و لەبەرژەوەندی موهەلیب، شەڕی کردبوو. ئەبوموسلیم، لەکاروبارەکان راوێژ و سەبارەت بەجەنگەکان، پرسیاری لێدەکرد.

وتارەکەیان لەکاتی بەیعەت وەرگرتن ئەمە بوو: لەگەڵ ئێوە بەیعەت دەبەستین لەسەر بنەمای نووسراوی خواوەند، شێوازی کردەوەکانی پێغەمبەر(د.خ) و شوێنەکەوتن و رەزامەند بوون بەفەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ). پەیمان و سوێندی خوایی لەسەر شانی ئێوەیە لەگەڵ رزگاری و ئازدای و پیادە رۆشتن بۆ حەج. نابێت رۆژیتان بووێت و چاوی تەماح ببڕنە مەبەستێکی دنیایی تا ئەو کاتەی فەرمانڕەواکانتان، خۆیان ئەم کارە دەستپێبکەن.

## هەڵاتنی نەسر کوڕی سەیار لەمەرو

ئەبوموسلیم، لاهیز کوڕی قورەیزی لەگەڵ وەفدێك بۆ لای نەسر کوڕی سەیار ڕەوانە و پێشنیاری لایەنگیری کردن لەنووسراوی خواوەند و فەرمانبەری بنەماڵەی پێغەمبەری، پێکرد. کاتێك بینی چ بەڵایەکی لەلایەن یەمانییەکان و خەڵکانی ڕەبیعەوە، بەسەر هاتووە و عەجەمەکان، چۆن گرفتارییان کردووە، و زانی ناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات، وای نیشاندا بەپێشنیارەکانی ئەبوموسلیم، ڕازی و بەم زوانە سەردانی دەکات و بەیعەتی لەگەڵ دەبەستێت. چاودێری ئەوانی دەکرد و بیری لەفێڵ و خۆدەرباز کردن دەکردەوە. تاشەو، چاوەڕوانی کرد. فەرمانی بەهاوەڵانیدا هەمان شەو، ڕوویکەنە ئەو شوێنانەی کەدەتوانن بەئاسوودەی ژیان بەسەر ببەن. سالم کوڕی ئەحوەز پێی وت: ئەمشەو، بۆ کۆچ کردن ئامادە نین، سبەی شەو، دەڕۆین.

بۆ بەیانی ئەو شەوە، ئەبوموسلیم هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و تا نیمەڕۆ دەستە شەڕکەرەکانی جیا و ئامادە کردەوە و جارێکی دیکە، لاهیز کوڕی قورەیزی بۆ لای نەسر نارد. نەسر وتی: چەندە خێرا گەڕانەوە. ئەگەر بەناچاری دەبێت بڕۆم، چاوەڕێ بن تا دەستنوێژ بگرم و دواتر بۆ لای ئەبوموسلیم، بەرێدەکەوم. کەسیان بۆ لای ئەبوموسلیمی ڕەوانە و پەیامی نارد: ئەگەر فەرمان وبڕیاری تۆ ئەمەیە، بۆ لای تۆ دێم و تا نێردراوەکەم دەگەڕێتەوە، خۆم ئامادە دەکەم. نەسر لەشوێنەکەی خۆی هەستا. کاتێك هەستا، لاهیز کوڕی قورەیز، ئەم ئایەی قورئانی خوێندەوە: سەران و سەرکردەکانی تۆ، دەنەدەنەی یەك دەدەن تا بتکوژن، بڕۆدەر چوونکە من لەچاکەخوازانی تۆم (قصص/٢٨/٢٠). نەسر ڕۆشتە ماڵەکەی خۆی و ئاگاداری کردنەوە کەچاوەڕوانی گەڕانەوەی نێردراوەکەی دەکات. کاتێك شەو داهات، لەدەلاقەی سەربانی ماڵەکەی بەرێکەوت و کوڕەکەی تەمیم کوڕی نەبی موسلیم و حەکەم کوڕی نەمیلەی نەمیری و مەرزبانەی هاوسەری، هاورێیەتیان دەکرد. هەموویان هەڵاتن. کاتێك لاهیز و هاوەڵانی دەرنگ کەوتنی ئەویان بینی، ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی وزانیان کەهەڵاتوە.

کاتێك ئەبوموسلیم لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، بەرەو لەشکرگەکەی نەسر بەرێکەوت و هاورێ نزیك و سەرکردەکانی سوپاکەی ئەوی گرت و شانی ئەوانی بەتوندی بەستەوە. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: سالم کوڕی ئەحوەز فەرماندەی پاسەوانەکانی، بەختەری،

دەبیرەکەی نەسر، دوو کوڕەکەی، یونس کوڕی عەبدوویە، محەممەد کوڕی قەتەن، موجاهید کوڕی یەحیا کوڕی حوسەین و کەسانیتر. بەبەند و زنجیری ئاسنین ئەوانی بەستەوە و ڕەوانەی زیندانی کردن. ئەوان، لەزینداندا مانەوە. ئەبوموسلیم و کوڕی کرمانی، هەمان شەو بەدوای نەسردا گەڕان. هاوسەرەکەیان بینی کەنەسر بەجێی هێشتبوو. ئەبوموسلیم و کوڕی کرمانی بۆ مرو گەڕانەوە. نەسر ڕۆشتە سەرەخس و سێ هەزار پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆبوونەوە. کاتێك ئەبوموسلیم گەڕایەوە، پرسیاری لەو کەسانە کرد کەئەوانی بۆ لای نەسر، ناردبوو: چ شتێك بووە هۆی گومانی نەسر کەبیری لەهەلاتن کردەوە؟ وتیان: لاهیز ئەم ئایەی خوێندەوە: گەورەکان سەبارەت بەتۆ بیر لەئەندێشەی خراپ دەکەنەوە تا بتکوژن (قصص/ ٢٨/٢٠). وتی: ئەمە بووە هۆی هەلاتنی ئەو. دواتر وتی: لاهیز، ئایین بەشێوەیەکی خراپ بەکار دەهێنیت، ئەوی کوشت.

ئەبوموسلیم سەبارەت بەهاوەلآنی نەسر، لەگەڵ باوکی تەڵحە راوێژی کرد بۆ ئەوەی بزانێت چییان لێبکات. وتی: قامچییەکەت بۆ شمشێر بگۆڕە و زیندان بکەرە، گۆڕستان. ئەبوموسلیم، ئەوانی کوشت. ژمارەیان بیست و چوار پیاو بوو.

بەلآم نەسر، لەشاری سەرەخسەوە بەرەو توس ڕۆشت و پانزە ڕۆژ لەوێ مایەوە و لەسەرەخس یەك ڕۆژ. دواتر ڕۆشتە نەیشابوور و لەو شارە، نیشتەجێ بوو. کوڕی کرمانی لەگەڵ ئەبوموسلیم ڕۆشتە مەرو و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوو و پەیمانی لەگەڵ بەست.

## کوژرانی شەیبانی حەروری

لەم ساڵەدا، شەیبان کوڕی سەلەی حەروری کوژرا.

هۆکاری کوشتنەکەی ئەمە بوو. شەیبان و کوڕی کرمانی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ نەسر پەیمانیان بەستبوو لەبەر ئەوەی شەیبان دژایەتی نەسری دەکرد چوونکە ئەوی بەیەکێك لەبەکرێگیراوەکانی مەروان دەزانی. شەیبان باوەڕی بەئەندێشەی خەواریج هەبوو و کوڕی کرمانی بۆیە دژایەتی نەسری دەکرد چوونکە باوکی لەسەر دەستی نەسر، کوژرا بوو. نەسر لەخەڵکانی موزەر و کوڕی کرمانی موالی دەستەیەکی یەمانی بوو. لەنێوان ئەم دووانە بەردەوام هەڵکشان و داکشان دەبینرا کەلای هەموان ئاشکرایە. کاتێك کوڕی کرمانی (بەوشێوەی باسمان کرد) لەگەڵ ئەبوموسلیم، پەیمانی ئاشتی بەست و لەشەیبان، خۆی دوور خستەوە، شەیبان، مەروی بەجێهێشت چوونکە دەیزانی توانای شەڕ کردنی لەبەرابەر کوڕی

کرمانی و ئەبوموسلیمدا نییە بەتایبەت دوای ئەوەی نەسر بۆ سەرەخس، هەلات.

کاتێك دەسەلاتی ئەبوموسلیم زیادی کرد، کەسی بۆ لای شەیبان نارد و پێشنیاری فەرمانبەری و بەیعەتی پێکرد. شەیبان وتی: من پێشنیاری فەرمانبەری کردن و بەیعەتی خۆمت پێدەکەم. ئەبوموسلیم پەیامی بۆ نارد: ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی ئێمە نابیت، لەم شارە برۆ. شەیبان کەسی بۆ لای کوڕی کرمانی نارد و داوای هاوکاری کرد بەلام کوڕی کرمانی، رازی نەبوو هاوکاری بکات. شەیبان رووی لەسەرەخس کرد و دەستەیەکی فراوان لەخەلکانی بەکر کوڕی وایل لەدەوری کۆبوونەوە. ئەبوموسلیم نۆ کەس لەخەلکانی ئەزدی بۆ لای ئەو نارد و پێشنیاری پێکرد تا دەست لەشەڕ هەلبگرێت. ئەو نێردراوەکانی ئەبوموسلیمی زیندانی کرد. ئەبوموسلیم، بۆ بەسام کوڕی ئیبراهیم (موالی بەنی لەیس لەئەبیوەرد) نامەی نووسی و فەرمانی پێدا بۆ شەڕ کردن لەگەل شەیبانی، بەرێکەوێت. بەسام بەرێکەوت و شەڕی لەگەل کرد. شەیبان شکستی خوارد و بەسام، شوێنیکەوت تا ئەوەی ڕۆشتە ناوشارەکە و لەوێ، شەیبانی و دەستەیەکی لەخەلکانی بەکر کوڕی وایل کوشت. بەئەبوموسلیمیان وت: بەسام، جارێکی دیکە، لەنایین هەلگەڕاوەتەوە، ئەو تەندروست، بەگوناحی نەخۆش دەکوژێت. ئەبوموسلیم ئەوی بانگ کرد. بەسان بەرێکەوت و پیاوێکی لەجێگەی خۆی دانا. کاتێك شەیبان کوژرا، پیاوێك لەبەکر کوڕی وایل لای نێردراوەکانی ئەبوموسلیم، تێپەڕی و ئەوانی کوشت.

دەستەیەك دەلێن: ئەبوموسلیم، لەلای خۆیەوە سوپایەکی بۆ شەڕی شەیبان ڕەوانە کرد کەفەرماندەکەیان، خەزیمە کوڕی خازم و بەسام کوڕی ئیبراهیم، بوون.

## کوژرانی دوو کوڕەکەی کرمانی

لەمساڵەدا ئەبوموسلیم، عەلی کوڕی کرمانی و عوسمان کوڕی کرمانی کوشت.

هۆکاری کوشتنی ئەوان ئەمە بوو: ئەبوموسلیم، پێشتر موسا کوڕی کەعبی بۆ ئەبیوەرد نارد و دەستی بەسەردا گرت و ئەبوموسلیمی لەسەرکەوتنەکەی خۆی ئاگادار کردەوە. باوکی داوودی بۆ بەلخ نارد کەفەرماندارەکەی، زیادی کوڕی عەبدولرەحمانی قوشیری بوو. کاتێك بیستی باوکی داوود مەبەستی هێرش کردنە سەر بەلخی هەیە، لەگەل خەلکانی بەلخ و تێرمێز و ناوچەکانی دیکە (لەشارەکانی تەخارستان) بەرەو جوزجان بەرێکەوت. کاتێك باوکی داوود لەوان نزیك کەوتەوە، هاوشێوەی هەلاتوان، روویان لەتێرمێز کرد و باوکی

داوود، ڕۆشتە ناو بەڵخ. ئەبوموسلیم نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە. لەجیاتی ئەو، باوکی میلا یەحیا کوڕی نوعەیمی ڕەوانە کرد. کاتێك یەحیا گەیشتە شاری بەڵخ، زیاد کوڕی عەبدولرەحمان نامەی بۆنووسی تا بگەڕێتەوە و پەیمانی لەگەڵ ببەستێت. یەحیا، ڕازی بوو و وەڵامی دایەوە. لەم کاتەدا زیاد و موسلیم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی موسلیمی باهلی و عیسا کوڕی زورعەی سولەمی و خەڵکانی بەڵخ و تێرمێز و پاشاکانی تەخارستان و ماوەراء ئەلنەهر، گەڕانەوە و یەحیا کوڕی نوعەیم، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بۆ پێشوازی کردنی ئەوان ڕۆشت. وتاریان بوو بەیەك: موزەرییەکان، یەمانییەکان، ڕەبیعییەکان و هاوڕێکانیان لەعەجەمەکان، ئەوان لەسەر بنەمای شەڕ لەگەڵ ڕەشپۆشەکان، پەیمانیان بەست و موقاتیل کوڕی حەییانی نبتیان وەك ڕێبەر و فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد. لەبەر ئەوە، ئەویان دەستنیشان کرد تا ڕێبەر، لەیەکێك لەسێ دەستە جیاوازەکە نەبێت و گرفتاری چەند بەرەکی نەبن.

ئەبوموسلیم فەرمانی بەباوکی داوددا، بگەڕێتەوە. ئەو و هاوڕێکانی گەڕانەوە تا لەسەر رووباری سەرجنان دابەزین. زیاد و هاوڕێکانی، باوکی سەعیدی قورەشیان ڕەوانەی پادگانەکە کردبوو تا هاوەڵانی باوکی داوود نەتوانن لەپشتەوە هێرشیان بکەنە سەر. ئاڵاکانی باوکی داوود، ڕەش بوو. کاتێك باوکی داوود و زیاد و هاوەڵانی ئەم دووانە، بۆ شەڕ ڕیزیان بەست، باوکی سەعید فەرمانی بەشەڕکەرانی خۆیدا هێرش بکەنە سەر زیاد و سوپاکەی. ئەوان لەپشتەوە هێرشیان کرد. کاتێك زیاد و هاوەڵانی ئالاَ ڕەشەکانی باوکی سەعیدیان بینی، بەبۆسەیەکی باوکی سەعیدیان دانا و هەڵاتن. باوکی سەعید شوێنیان کەوت و هەموو شەڕکەرانی زیاد لەڕوباری سەرجنان، خنکان و پاشماوەی سوپاکەی کوژران. باوکی داوود ڕۆشتە ناو لەشکرگەکەی ئەوان و تاڵانی کرد.

زیاد و یەحیا و هاوڕێکانی، ڕوویان لەتێرمێز کرد و باوکی داوود، سامانی کوژراو و هەڵاتوانی تاڵان و دەسەڵاتی بەسەر بەڵخدا بلاَو کردەوە.

ئەبوموسلیم نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە. نەزر کوڕی سەبیحی موڕی وەك فەرمانداری بەڵخ ڕەوانە کرد. باوکی داوود گەڕایەوە بۆ لای ئەبوموسلیم و ئەم دووانە ڕێککەوتن تا لەنێوان عەلی کوڕی کرمانی و عوسمان کوڕی کرمانی، جیایی دروست بکەن. ئەبوموسلیم، عوسمان کوڕی کرمانی وەك فەرمانداری بەڵخ، ڕەوانە کرد. کاتێك ڕۆشتە بەڵخ، فەرافسە کوڕی زوهەیری عەبەسی وەك جێگری خۆی

لەبەڵخ دەستنیشان کرد.

موزەرییەکان لەتێرمێزەوە بەرێکەوت و رێبەرەکەیان، موسلیم کوڕی عەبدولرەحمانی باهلی بوو. ئەوان روبەرووی شەرکەرانی عوسمان بوونەوە و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد کەدەرئەنجامەکەی، سوپاکەی عوسمان شکستی خوارد و موسلیم، دەستی بەسەر بەڵخدا گرت. ئەم هەواڵە کاتێك بەنەزر کوڕی سەبیح و عوسمان گەیشت کەهەردووکیان لەمەرو بوون. ئەوان، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە و شەڕ بەرێکەوتن و هاوەڵانی عەبدولرەحمان، هەمان شەو هەڵاتن بەلام نەزر، شوێنیان نەکەوت بەو هیوایەی، لەناو بچن. هاوەڵانی عوسمان رووبەروویان بوونەوە و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد بەلام نەزریان لەگەڵدا نەبوو. شەرکەرانی سوپاکەی عوسمان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەوان کوشتار کران. باوکی داوود لەمەرو بەرەو بەڵخ بەرێکەوت و ئەبوموسلیم هاورێ لەگەڵ عەلی کرمانی، رووی لەنەیشابوور کرد. ئەبوموسلیم و باوکی داوود لەسەر ئەوە رێککەوتن کە ئەبوموسلیم عەلی بکوژێت و باوکی داوود، عوسمان. کاتێك باوکی داوود گەیشتە بەڵخ، عوسمانی وەك فەرمانڕەوای کوێستانەکان دەستنیشان و هاوەڵانی ئەوی لەخەڵکانی مەروی لەگەڵدا ڕەوانە کرد. کاتێك لەبەڵخ ڕۆشتەدەر، باوکی داوود شوێنی کەوت و خۆی و هەموو هاوەڵانی گرت و زیندانی کردن. ئەوانی بەئەشکەنجەوە کوشت. لەهەمان رۆژ، ئەبوموسلیم، عەلی کوڕی کرمانی کوشت. ئەبوموسلیم داوای لێکردبوو هاوەڵە تایبەت و نزیکەکانی خۆی پێ بناسێنێت تا بۆ کاروبارە گرنگەکان، کەڵکیان لێوەربگرێت و فەرمان بدات دیاری و جل و بەرگی گرانباییان پێببەخشن.، عەلی ئەوانی یەك یەك، پێناساند و ئەبوموسلیم، هەموویانی لەناو برد.

## هاتنی قەحتەبە لەلایەن ئیبراهیمی رێبەرەوە

لەم ساڵەدا قەحتەبە کوڕی شەبیب لەلایەن ئیبراهیمی رێبەرەوە گەیشتە لای ئەبوموسلیم و ئالایەکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کەئیبراهیم، بۆی بەستبوو. ئەبوموسلیم ئەوی لەگەڵ پێشەنگەکانی خۆی ڕەوانە و سوپاکەی خستە ژێر دەسەلاتی ئەو و لابردن و دانانی کەسانی بەو سپارد و فەرمانی بەشەرکەراندا گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی بن.

## ڕۆشتنی قەحتەبە بۆ نەیشابوور

کاتێك (وەك باسمان کرد) شەیبانی خارجی و دوو کوڕەکەی کرمانی کوژران و نەسر کوڕی سەیار، لەمەرو هەڵات و ئەبوموسلیم دەستی بەسەر خوراساندا گرت، کارگوزارەکانی بۆ شارەکان ڕەوانە کرد. سەباع کوڕی نەعمانی ئەزدی وەك فەرمانداری سەمەرقەند، باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیمی وەك فەرمانداری تەخارستان، محەممەد کوڕی ئەشعەسی وەك فەرمانداری تەبسین دەستنیشان کرد. مالك کوڕی هەیسەمی کردە فەرماندەی پاسەوانەکان. قەحتەبە و ژمارەیەك لەفەرماندەکانی بۆ توس نارد کە ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: باوکی عەون عەبد مەلیك کوڕی یەزید، خالید کوڕی بەرمەك، عوسمان کوڕی نەهیك، خازم کوڕی خوزەیمە وکەسانیتر. قەحتەبە ڕووبەڕووی دانیشتوانی توس بوویەوە و ئەوانی شکستدا. ئەو کەسانەی لەژێر دەست و پێی ئەواندا کوژران، زیاتر لەوکەسانە بوون کە لەگۆڕەپانی شەڕدا کوژران. ژمارەی کوژراوەکان، دەیان هەزار کەس بوو.

ئەبوموسلیم، قاسم کوڕی موجاشیعی بۆ نەیشابوور نارد. ئەوی لەڕێگەی کاروان و حاجییەکانەوە ڕەوانە کرد و نامەی بۆ قەحتەبە نووسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ تەمیم کوڕی نەسر کوڕی سەیار و نابی کوڕی سوەید و پەنابەرانی ئەم دووانە لەخەڵکانی خوراسان، شەڕ بکات. هاوەڵانی شەیبان کوڕی سەلەی خارجی، پەیوەستی نەسر ببوون. ئەبوموسلیم، عەلی کوڕی مەعقەلی لەگەڵ دەهەزار شەڕکەر بۆ شەڕی تەمیم کوڕی نەسر ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا هاوڕێ لەگەڵ قەحتەبە، هێرش ببات. قەحتەبە بەرەو سوزگان بەڕێکەوت کە لەشکرگەی تەمیم کوڕی نەسر و نابی بوو. ئەو، هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ ئامادە و پێشڕەوی دەستپێکرد. پێشنیاری شوێنکەوتنی نووسراوی خواوەند و ڕازی بوون بەفەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی محەممەدی پێکردن کەرازی نەبوون. بەوپەڕی هێزەوە، شەڕی لەگەڵ کردن. تەمیم کوڕی نەسر لەگۆڕەپانی شەڕ کوژرا و هاوەڵانی کوشتار و لەشکرگەکەی، تاڵان کرا. ژمارەی شەڕکەرانی، سی هەزار کەسێك دەبوو.

نابی کوڕی سوەید هەڵات و لەشارەکەدا سەنگەری گرت. قەحتەبە، گەمارۆی خستەسەر. ژێر دیواری شارەکەیان هەڵکەند وڕێڕەوێکی ژێرزەمینیان دروست کرد و ڕۆشتنە ناو شارەکە. نابی و هاوەڵانی ئەویان کوشت. ئەم هەواڵە لەنەیشابوور بەنەسر کوڕی سەیار گەیشت و لەکوژرانی کوڕەکەی ئاگادار بوویەوە.

کاتێك قەحتەبە دەستی بەسەر لەشکرگەکەی ئەواندا گرت، ئەوی وەك تالآنی دەستی کەوتبوو، بۆ خالید کوڕی بەرمەکی نارد و خۆی بەرەو نەیشابوور بەرێکەوت. نەسر کوڕی سەیار لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی هەڵات و ڕووی کردە قومس. هاوەڵانی لەدەوری ئەو بڵاوەیان کرد. نەسر ڕوشتە گورگان و لای نوباتە کوڕی حەنزەلە مایەوە. قەحتەبە و سوپاکەی، ڕێگەی نەیشابووریان گرتەبەر و ڕەمەزان و شوال/ مەی و ژوئەنی ٧٤٨ زایینی، لەوشارە بەسەر برد.

کوژرانی نوباتە کوڕی حەنزەلە

لەم ساڵەدا نوباتە کوڕی حەنزەلە (کارگوزاری یەزید کوڕی هوبەیرە لەگورگان) کوژرا. یەزید کوڕی هوبەیرە، ئەوی بۆ لای نەسر ناردبوو. ئەو، ڕۆشتە پارس و لەوێ بۆ ئیسفەهان و دواتر، ڕۆشتە گورگان. بەهەمان شێوە کەباسمان کرد، نەسر بەرەو قومس، ڕۆشت. پێیان وت: قومس، نامانگرێتە خۆ. نەسر، بەرەو جەرجان بەرێکەوت و لەگەڵ نوباتە، لەو شارە دابەزی. ئەم دووانە سەنگەریان بۆ خۆیان هەڵکەند.

قەحتەبە لەزی قەعدە/ ژوئیەیی ٧٤٧ زایینی، ڕووی کردە گورگان. وتی: ئەی خەڵکانی خوراسان، ئایا دەزانن ڕوبەرووی کێ دەبنەوە و شەڕ لەگەڵ کێ دەکەن؟ پاشماوەی کەسانێك لەناو دەبەن کەماڵی خوایان سوتاند. حەسەن کوڕی قەحتەبە، فەرماندەی پێشەنگەکانی سوپاکەی باوکی بوو. دەستەیەکی بۆ لەشکرگەکەی نوباتە ڕەوانە کرد. فەرماندەی ئەم پادگانە، پیاوێك بوو بەناوی زوەیب. بەشێوەیەکی لەناکاو، هێرشیان کردە سەریان و زوەیب و حەفتا کەس لەهاوەڵانی ئەویان کوشت و بۆ لای حەسەن گەڕانەوە.

قەحتەبە بەرێکەوت و لەبەرابەر نوباتە، ڕیزی بەست. ژمارەی سوپاکەی بەرادەیەك فراوان بوو کەخەڵکان پێشتر هاوشێوەی ئەوەیان نەبینیبوو. کاتێك خەڵکانی خوراسان ئەوانیان بینی، ترسیان لێ نیشت و تەنانەت ترسی خۆیان هێنایە سەرزمان و بەئاشکرا، باسیان لێوە کرد. قەحتەبە، لەوتارەکەی ئەوان ئاگادار بوویەوە. لەناو ئەوان هەستا و وتی: ئەی خەڵکانی خوراسان، ئەمە سەرزەمینی باوکانی ئێوە بووە. ئەوان تەنیا لەبەر ئەوەی دادپەروەر بوون و چاکەکار، بەسەر دوژمنانیاندا سەردەکەوتن. ستەمیان کردە پیشە و ئایینی خواوەندیان گۆڕی و پەروەردگار، لێیان تورە و فەرمانڕەوایەتی لێسەندنەوە و ڕیسواترینی خەڵکانی جیهانی (عەرەبەکان) بەسەر ئێوەدا زاڵ کرد کەدەستیان بەسەر

شارەکانی ئێوەدا گرت. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەوان دادپەروەریان کردە پیشە و ڕێزیان لەپەیمانەکان گرت و هاوکاری ستەملێکراوەکانیان کرد. دواتر ئایینی ئیسلامیان بەلاڕێدا برد و لەفەرمانڕەوایەتیدا، ستەمکاریان کردە پیشە و چاکەکارن و خۆپارێزانیان لەبنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، ترساند و بەمشێوەیە، خواوەند ئێوەی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد تا لەسەر دەستی ئێوە، تۆڵە لەوان بستێنێتەوە بۆ ئەوەی سزاکەتان، بەئازارتر بێت چوونکە ئێوە، تۆڵەتان کردۆتەوە. ڕێبەر، ئەم پێشگۆییەی بۆ کردووم کەئێوە، بەم ژمارەوە، رووبەرووی ئەوان، دەبنەوە و شەڕیان لەگەڵ دەکەن و بەخواستی خوا، شکستیان پێدەهێنن و کوشتار و لەناویان دەبەن. ئەوان، رۆژی هەینی یەکی زی حەججەی ١٣٠/ یەکی ئوتی ٧٤٨ زایینی، رووبەرووی یەك بوونەوە. قەحتەبە، پێش شەڕ بەوانی وت: ڕێبەر مژدەی سەرکەوتنی بەئێمەداوە و لەم رۆژە و لەم شوێنەدا، شکستیان پێدەهێنن. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی، حەسەنی کوڕی بوو. پیاوانە تێکۆشان و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. نوباتە کوژرا و خەڵکانی شام، شکستیان خوارد و دە هەزار کەس، لەوان کوژران. سەری بڕاوی نوباتەیان بۆ ئەبوموسایم، ڕەوانە کرد.

## شەڕی باوکی حەمزەی خارجی لەقودەید

لەم ساڵەدا، حەوت رۆژ بۆ کۆتایی مانگی سەفەر/ یەکی نۆڤەمبەری ٧٤٧ زایینی، لەقودەید، شەڕی نێوان خەڵکانی مەدینە و باوکی حەمزە، روویدا.

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەعەبدولواحید کوڕی سلێمان، رەشبگێری لەناو خەڵکانی مەدینەدا کردە کارێکی زۆرەملێ و عەبدعەزی کوڕی عەبدوڵڵەی وەك فەرماندەی ئەوان دیاری کرد. ئەوان هاتنەدەر و کاتێك گەیشتنە حەر، قوربانییەکانیان بینی کە بۆ شارەکە، هێنرا بوو. بەهەمان شێوە پێشڕەوییان کرد. کاتێك گەیشتنە عەقیق، ئاڵاکانیان بەلقی داری (چقڵی وشتر، سەمورە) گیری کرد و دڕان. خەڵك هاتنەدەرەوەمین خۆیان بەخراپە لێکدایەوە. نێردراوانی حەمزد هاتنە لایان و وتیان: سوێند بەخوا نیازمان بەشەڕ کردن لەگەڵ ئێوەیە، ڕێگەمان بدەن، روبەرووی دوژمنەکەی خۆمان ببینەوە. خەڵکانی مەدینە، بەو پێشنیارە رازی نەبوون و بەرێکەوتن تا لەقودەید، دابەزین. خەڵکێکی خۆشرابووێر بوون و لەناو ئەوان، شەڕ کردن کەمتر دەبینرا. نەهاتبوونە خۆ کەشەڕکەرانی باوکی حەمزە، لەفەزاسەوە، هێرشیان کردنە سەر و کوشتاریان کردن. کوشتاری گشتی لەناو قوڕەیشیەکان و شکۆ و

گەورەیی ئەوان، بەفیڕۆ چوو. ژمارەیەکی زۆر لەوان کوژران و تێکشکاوەکان، بۆ ناو مەدینە گەڕانەوە. ژنان بۆ کەسە نزیکەکانی خۆیان گریان و ژنانی دیکە، پرسەیان لەگەڵ گێڕان. ژنەکان، لەشوێنی خۆیان هەڵنەدەستان کەهەواڵی مەرگی هاوسەرەکانیان پێدەگەیشت. یەك یەکی ژنەکان بۆ لای کوژراوەکانی خۆیان دەڕۆشتن بەشێوەیەك پرسەکان چۆڵ دەبوو. ئەمە بەهۆی زۆری ژمارەی کوژراوەکانەوە بوو.

دەستەیەك دەڵێن: خەڵکانی خوزاعە، باوکی حەمزەیان لەشوێنی شەڕکەرانی قودەید ئاگادار کردەوە. هەروەها دەڵێن: ژمارەی کوژراوەکان، حەوتسەد کەس بوو.

## ڕۆشتنی باوکی حەمزە بۆ ناو مەدینە

لەم ساڵەدا، لە١٣ سەفەر/ ٢٣ ئۆکتۆبەر ٧٤٧ زایینی، ڕۆشتە ناو مەدینە. عەبدولواحید بۆ شام کۆچی کرد. پێشتر باوکی حەمزە، ئاگاداری پێویستی پێدابوو. پێی وتبوون: ئێمە پێویستمان بەشەڕ کردن لەگەڵ ئێوە نییە، ڕێگە بدەن ڕووبەڕووی دوژمنانی خۆمان ببینەوە. خەڵکانی مەدینە ڕازی نەبوون و شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت و دواتر، ڕۆشتە ناو مەدینە، بەسەر تەختی وتاردانداا سەرکەوت و وتی:

ئەی خەڵکانی مەدینە، لەڕۆژگاری ئەو پیاوە یەك چاوە (هوشام کوڕی عەبدولمەلیك) هاتمە لای ئێوە. زیان بەمیوەکانی ئێوە گەیشتبوو و ئێوە، نامەتان بۆ نووسی تا قورسایی باج لەسەر شانی ئێوە هەڵبگرێت و ئەو، ئەو کارەی کرد. بەتواناکانتان، دەوڵەمەندتر بوون و هەژارەکانتان، هەژارتر. وتتان: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە. خواوەند پاداشتی چاکەی ئێوە نەداتەوە هەروەها ئەویش. ئەی خەڵکانی مەدینە، بزانن لەماڵەکانی خۆمان بەمەبەستی تەماحکاری و زیان گەیاندن و ڕابواردن و گاڵتە کردن، نەهاتووینەتەدەر و خوازیاری پاشایەتی نین، هەروەها ڕقی کەسمان لەدڵدا نییە و بمانەوێت، تۆڵە بستێنینەوە. ئێمە، بینیمان کەچراکانی ڕاستی کوژاونەتەوە و سەرچاوەکانی دروستی، وشکیان کردووە. بێژەری ڕاستییەکان ڕیسوا و دادپەروەرەکان، لەناوچوون، زەوی، بەهەموو فراوانییەوە، بۆ ئێمە تەنگ و تەسك و کاروباری ئێمە، لێوانلێوە لەفریو. بیستمان کەکەسێك پێشنیاری گەڕانەوە بۆ خواپەرەستی و شوێنکەوتنی نوسراوی خواوەندمان پێدەکات، وەڵامی بانگەوازی ئەومان دایەوە و بۆ ئەم مەبەستە، تێکۆشایین (هەرکەس وەڵامی بانگەوازی خواوەند بداتەوە، کەس لەسەر زەوی بەناتەوانی ناکوژێت) (ئەحقاف/٤٦/٣٢) ئێمە لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەهۆزە

جۆراوجۆرەکان هاتینەدەر و هەزارترینی خەڵکانی سەرزەوی بووین. خواوەند بەبەخششەکانی خۆی، پەنایداین و سەرکەوتنی بەئێمە بەخشی و لەگەڵ ئێوە بووینە برادەرانی بەرابەر لەسەر بنەمای دادپەروەری. دواتر لەگەڵ پیاوەکانی ئێوە روبەروو بووینەوە و لەقودەید شەڕمان کرد. ئێمە پێشنیاری فەرمانبەری خواوەندمان پێکردن و قورئان بکەینە داوەر. ئەوان پێشنیاری فەرمانبەری شەیتان و مەروانییەکانیان پێکردین. سوێند بەگیانی خۆم، دووره دوو رێگەی نێوان گومرایی و رزگاری. ئەوان بەپەلە هێرشیان کردە سەر ئێمە و کایەکەیان بەشەیتان دۆڕاند. لەناو قازانەکانی شەیتان، خوێنی ئەوان قوڵتیدا و گومان، داپپۆشین. شەڕکەرانی خواوەند، لەناو دەستە شەڕکەرەکان، دەستە دەستە و دڵگەرم هاتن و شمشێری تیژی هیندیان لەکەمەر بەست. ئاشی ئێمە سوورا و ئاشی ئەوان رووخا. بەشێوەیەك شمشێرمان وەشاند کەگومانداران پەرێشان و شڵەژان و شەڕکەران، یەك یەك کوژران. ئێوە ئەی خەڵکانی مەدینە، ئەگەر پشتیوانی لەمەروان و مەروانییەکان بکەن، خواوەند یا بەئەشکەنجەی خۆی، لەناوتان دەبات یا لەسەر دەستی ئێمە و ئەوسا (دڵی خواپەرستان ئارام و ئاسوودە دەبێت) (تۆبە/ ٩/ ١٤) ئەی خەڵکانی مەدینە، سەرەتاکانتان باشترین سەرەتاکان، بوو و کۆتاییتان، خراپترین کۆتاییەکان. ئەی خەڵکانی مەدینە، لەهەشت بەهرە ئاگادارم بکەنەوە کەخوای گەورە لەنوسراوەکەی خۆی لەسەر بەهێز و هەژار، پێویستی کردووە و نۆیەم سوود باسی لێوەکراوە بێ ئەوەی بەهرەی هەبێت.

ئەی خەڵکانی مەدینە، بیستوومە شەڕکەران و هاوەڵانی من بەکەم و کوڕ ناودەبەن و بەلاواز، لەقەڵەمیان دەدەن. وتووتانە: گەنجانێکی تازەکار و عەرەبەکانی خراپ کردار و پێ پەتییە ناسازگارەکانن. هاوار لەئێوە! مەگەر هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) برسی نەبوون و پێ پەتیی ژیانیان بەسەر نەدەبرد و جل وبەرگی کۆنەیان نەدەپۆشی؟ سوێند بەخوا ئەم گەنجانە، بەئاوز، گەورەن چوونکە چاو لەخراپەکاری ناپۆشن و ناڕاستییەکان بەدژوار و خۆیانی لێ بەدوور دەگرن.؟ بەشێوەیەکی باش هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکانی مەدینە کرد تا ئەو جێگەی کەوتی: هەرکەس زینا بکات، ناباوەڕە، هەرکەس دزی بکات، ناباوەڕە و هەرکەس لەناباوەڕی ئەم دوودەستەیە، گومان بکات، ناباوەڕە.

باوکی حەمزە،بۆ ماوەی سێ مانگ لەمەدینە مایەوە.

## کوژرانی باوکی حەمزەی خارجی

دواتر، باوکی حەمزە ماڵئاوایی لەخەڵکانی مەدینە کرد و وتی: ئەی خەڵکانی مەدینە، ئێمە بۆ روبەروو بوونەوەی مەروان دەڕۆین، ئەگەر سەرکەوتین، سەبارەت بەبراکانتان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس و کەوت و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ شێوازی پێغەمبەریان پێدەکەین. ئەگەر ئەوە رووبدات کەئێوە چاوڕانی دەکەن (ستەمکاران بەزووترین کات دەزانن کەرووبەروی کام چارەنووسە دەبنەوە (شعراء ٢٦/٢٢٧).

بەرەو شام بەرێکەوت. مەروان چوار هەزار شەڕکەری لەسوپاکەی خۆی هەڵبژارد و عەبدمەلیك کوڕی محەممەد کوڕی عەتییەی سەعدی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدان لەزووترین کاتدا هێرش بکەنە سەر دوژمنان و شەڕ لەگەڵ خەواریج، دەستپێبکەن. ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوتن پێشڕەوی بکەن تا دەگەنە یەمەن و لەوێ لەگەڵ عەبدوالله کوڕی یەحیا، شەڕ ئەزمون بکەن.

کوڕی عەتییە بەرێکەوت و لەوادی قوری، رووبەرووی باوکی حەمزە بوویەوە. باوکی حەمزە بەهاوەڵانی خۆی وت: شەڕ دەستپێمەکەن تا ئەو کاتەی ئەوان هێرش دەبەن. هاوەڵانی باوکی حەمزە هاواریان کرد: سەبارەت بەقورئان و کار کردن بەفەرمانەکانی چی دەڵێیت؟ کوڕی عەتییە وتی: فڕیدەدەینە ناو بارەکانمان. وتیان: سەبارەت بەدارایی کوڕی بێ باوك چی دەڵێیت؟ وتی: سامانەکەیان دەخۆین و دایکیان دەگێین. پرسیاری دیکەیان کرد و وەڵامی لەو چەشنەیان دەستکەوتەوە. کاتێك وتەکانی ئەویان بیست، شەڕیان دەسپێکرد تا ئەوەی شەو داهات و هاواریان کرد: ئەی کوڕی عەتییە، هاوار لەتۆ! خواوەند، شەوی بۆ ئارامی و ئاسوودەی، ئافراندوە. بحەسێرەوە. بەڵام کوڕی عەتییە رازی نەبوو و هێرشی کردە سەریان تا ئەوەی شکستی پێهێنان و کوشتاری کردن. ئەو دەستە لەهاوەڵانی باوکی حەمزە کەهێشتا نەکوژرابوون، هەلاتن و بۆ مەدینە گەڕانەوە. لەمەدینە، گەمارۆی خستەسەر ئەوان و لەناوی بردن. کوڕی عەتییە ڕۆشتە مەدینە وبۆ ماوەی مانگێك، مایەوە.

لەو کەسانەی لەگەڵ باوکی حەمزەدا کوژران، عەبدی عەزیز، قورئانی خوێنی مەدینە ناسراو بە(بێ شکست) بوو کەرێزمانی عەرەبی بەباشی دەزانی. یەکێك بوو لەخەڵکانی مەدینە بەڵام شوێنکەوتەی خەواریج و کاتێك باوکی حەمزە ڕۆشتە ناو مەدینە، پەیوەستی بوو. کاتێك خەواریج کوژران، لەگەڵ ئەواندا کوژرا.

## کوژرانی عەبدوڵڵە کوڕی یەحیا

کوڕی عەتییە دوای ئەوەی یەك مانگ لەمەدینە مایەوە، بەرەو یەمەن بەڕێکەوت و وەلید کوڕی عورود کوڕی محەممەد کوڕی عەتییەی وەك فەرمانداری مەدینە، بەجێهێشت. پیاوێکی خەڵکی شامی کردە فەرمانداری مەککە و بەرەو یەمەن، پێشڕەوی کرد. عەبدوڵڵە کوڕی یەحیا، لەسەنعا بوو کەهەواڵی هاتنی ئەوی بیست. لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی رووبەرووی بوویەوە. کوڕی یەحیا کوژرا و سەری بڕوای ئەویان بۆ مەروان ڕەوانە کرد. کوڕی عەتییە بەرەو سەنعا بەڕێکەوت.

## کوژرانی کوڕی عەتییە

کاتێك کوڕی عەتییە بەرەو سەنعا بەڕێکەوت، ڕۆشتە ناو شارەکە و لەوێ مایەوە. مەروان نامەی بۆ نووسی وفەرمانی پێدا بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکان بەرەو حەج، بڕوات. بەفەرمانی مەروان، هاوڕێ لەگەڵ دوانزە کەسی دیکە سەرپەرەستی حاجییەکانی گرتەئەستۆ. چل هەزار کەس هاوڕێیەتیان دەکرد. بەڕێکەوت و سوارە و پیادەکانی خۆی لەسەنعا بەجێهێشت و لەداوێنی کوێستان دابەزی. دوو کوڕی جەهانەی موڕادی و دەستەیەکی فراوان لەدەوری کۆبوونەوە و بەخۆی و هاوەڵانیان وت: ئێوە دزن. کوڕی عەتییە، فەرمانەکەی خۆی دەرهێنا و وتی: ئەمە فەرمانی سەروەری باوەڕدارانە و من، کوڕی عەتییەم. وتیان: ئەمە هەڵیت و پڵیتە. ئێوە دزن. کوڕی عەتییە، شەڕی لەگەڵ کردن تا ئەو کاتەی کوژرا.

## کوشتاری خەڵکانی گورگان لەسەر دەستی قەحتەبە

لەم ساڵەدا، قەحتەبە، نزیکەی سی هەزار کەس لەخەڵکانی گورگانی کوشت.

چۆنیەتییەکەی ئەوەی کە: دوای کوژرانی نوباتە کوڕی حەنزەلە، ئاگادار بوویەوە کەدەیانەوێت هێرشی بکەنە سەر. کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت، ڕۆشتە ناو ئەوان و لێکۆڵینەوەی لێکرد و کەسانێکی لەناو ئەوان کوشت (پێشتر ئاماژەمان پێدا). نەسر کە لەقومس بوو بەڕێکەوت و لە (خواری رەی) دابەزی. کوڕی هوبەیرە کە لەگەڵ دەستەیەك لەگەورەکانی خوراسان، لەواست ژیانیان بەسەر دەبرد، هاوکاری ئەویان دەکرد. ئەم کارەی

بەلاوە دژوار و ئەو، پێی وت: بەرادەیەك درۆم لەگەڵ خەڵکانی خوراسان کردووە کەئێستا هیچ کام لەوان وتەکانی من بەراست نازانن. دەهەزار پیاوی شەڕکەر بۆ هاوکاری من ڕەوانە بکە پێش ئەوەی ڕەوانە کردنی سەد هەزار شمشێر وەشێن، هیچ سوودێکی نەبێت. کوڕی هوبەیرە، نێردراوانی نەسری خستە زیندانەوە. نەسر پەیامی بۆ مەروان نارد: من دەستەیەك لەگەورەکانی خوراسانم بۆ لای کوڕی هوبەیرە نارد بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەنەوە لێرە، ڕووبەرووی چ گرفتاری و کێشەیەك بووینەتەوە. داوام لێکرد هێزی پشتیوانم بۆ بنێرێت بەلام ئەو نێردراوەکانی منی زیندانی کرد و کەسی بۆ هاوکاریم نەنارد. بەسەرهاتی من هاوشێوەی کەسێکە کە لەماڵەکەی بۆ ژوورەکەی دەریبکەن و لەژوورەکەی بۆ حەوشێکەی و لەوێوە بۆ سێبەری ماڵەکەی. ئەگەر کەسێك فریای بکەوێت و هاوکاری بکات، هیوادارە بۆ ماڵەکەی بگەڕێتەوە و ماڵەکەی لەدەست نەدات، بەلام ئەگەر بۆ کۆلانەکە دووری بخەنەوە، نەماڵی بۆ دەمێنێتەوە، نەسێبەری دیوارێك.

مەروان نامەی بۆ کوڕی هوبەیرە نووسی و فەرمانی پێدا هێزی پشتیوان بۆ نەسر ڕەوانە بکات. هەروەها نامەی بۆ نەسر نووسی و لەفەرمانەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە. کوڕی هوبەیرە سوپایەکی گەورەی بۆ شەڕ ئامادە کرد و کوڕی غەتیفی کردە فەرماندەی ئەوان و بۆ هاوکاری نەسر، ڕەوانەی کرد.

## بیر کردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، وەلید کوڕی هوشام، لەهاویندا شەڕی کرد. ئەو لەقوولاییەکاندا پێشڕەوی کرد و بناغەی قەلای مەرعەشی داڕشت. هەروەها لەم ساڵەدا نەخۆشییەکی گشتگیر سەراسەری بەسرەی گرتەوە.

محەممەد کوڕی عەبدمەلیك کوڕی مەروان، ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو، فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف بوو. لەعێراق، یەزید کوڕی هوبەیرە فەرمانڕەوایەتی دەکرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە حەجاج کوڕی عاسمی موحاربی و دامەزراوەی دادی بەسرە، عیباد کوڕی مەنسوری خوراسانی بوو.

ئەبوو جەعفەری تەبەری لێرەدا بەمشێوەیە دەگێڕێتەوە کەمحەممەد کوڕی عەبدمەلیك، لەم ساڵەدا ئایینی حەجی ئەنجامدا بەلام پێشتر دەڵێت، فەرمانداری مەدینە، عوروە کوڕی وەلید بوو. هەروەها لەکۆتایی ١٣١/ ژوئەنی ٧٤٩ زایینی دەڵێت: عوروە

فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف بوو و لەم ساڵەدا، ئەو، ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان، ئەنجامدا.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: باوکی جەعفەر یەزید کوڕی قەعقاعی قورئان خوێن کۆیلەی عەبدوالله کوڕی عەباس کە لەمەدینە مرد، هەروەها دەڵێن: لەقودەید (بەکۆیلەی ئەبووبەکر کوڕی عەبدولرەحمان) ناوی برا، ئەییووب کوڕی ئە بی تەمیمەی سەختیانی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ٧٣٧/١١٩ زایینی مرد و ساڵەکانی تەمەنی، ٦٣ ساڵ درێژەی کێشا. ئیسحاق کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەبی تەڵحە کەدەڵێن: لەساڵی ١٣٢/ ٧٤٩-٧٥٠ زایینی یا لەساڵی ١٣٤/ ٧٥١ زایینی، مرد و نازناوەکەی، باوکی نوجەیحە. محەممەد کوڕی مەخریمە کوڕی سلێمان لەتەمەنی ٧٠ ساڵی، باوەگی وەجرە یەزید کوڕی عوبەیدی سەعدیب، باوکی حوەیرس، یەزید کوڕی ئەبی مەلەکی هەمەدانی، یەزید کوڕی رۆمان، عێکرەمە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هوشام، عەبدعەزیز کوڕی روفەیع بەناوی باوکی عەبدوالله مەککی کەنزیکەی سەد ساڵ ژیا و هیچ ژنێك نەیدەتوانی لەگەڵ ئەودا بمێنێتەوە لەبەر ئەوەی زیاد لەرادە، لەژنان نزیك دەکەوتەوە. ئیسماعیل کوڕی ئەبی حەکیم دەبیر عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، یەزید کوڕی ئەبان ناسراو بەناوی یەزیدی رەشك ناسراو بەناوی قسام (دابەشکەر) لەبەسرە. حەفس کوڕی سلێمان کوڕی موغەیرە کە لەساڵی ٨٠/ ٦٩٩ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و سی و یەکی کۆچی (( ٧٤٨- ٧٤٩ زایینی )

### مەرگی نەسر کوڕی سەیار

لەم ساڵەدا، نەسر کوڕی سەیار لەساوە لەنزیك ڕەی، مرد.

هۆکاری ڕۆشتنەکەی بۆ ئەوێ ئەوە بوو کە: نەسر دوای کوژرانی نوباتە ڕۆشتە (خواری ڕەی) کەفەرماندارەکەی نەبووبەکری عەقیلی بوو. قەحتەبە کوڕەکەی حەسەن کوڕی قەحتەبەی لەموحەرەمی ١٣١/ سێپتامبەری ٧٤٨ زایینی لەگەڵ باوکی کامیل و باوکی قاسم موحریز کوڕی ئیبراهیم و باوکی عەباس مەروزی، بۆ شەڕی نەسر ڕەوانە کرد. سەرەتا حەسەنی کوڕی ڕۆشت و دواتر ئەم سیانە. کاتێك ئەوان لەحەسەن نزیك کەوتنەوە، باوکی کامیل لەلەشکرەکەی هاتەدەر و پەیوەستی نەسر بوو و لەشوێن و بارودۆخی ئەو سوپایەی بەجێهێشتبوو، ئاگاداری کردەوە.

نەسر سوپایەکی ڕەوانە کرد. سوپاکەی قەحتەبە هەڵاتن و بەشێك لەکەل و پەلەکانی خۆیان بەجێهێشت و هاوەڵانی نەسر وەك تاڵانی، کۆیان کردەوە. نەسر نێردراوێکی بەنامەیەك بۆ لای کوڕی هوبەیرە نارد کەکوڕی غەتیف لەشاری ڕەی، ڕێگەی لێگرت و کەل و پەلەکانی لێوەرگرت و بۆ لای کوڕی هوبەیرە، ڕەوانەی کرد. نەسر تووڕە بوو وتی: سوێند بەخوا گرنگی بەکوڕی هوبەیرە نادەم بەشێوەیەك کەگومان بکات، بەهای هیچ شتێکی نییە.

سێ هەزار شەرکەر، هاوڕێیەتی کوڕی غەتیفیان دەکرد. کوڕی هوبەیرە، ئەوی بۆ هاوکاری کردنی نەسر، ڕەوانە کردبوو بەڵام لەشاری ڕەی مایەوە و بۆ لای نەسر نەڕۆشت. نەسر بەڕێکەوت تا لەشاری ڕەی دابەزی. فەرماندارەکەی حەبیب کوڕی یەزیدی نەشهەلی بوو. کاتێك نەسر گەیشتە ڕەی، کوڕی غەتیف ئەو شارەی چۆڵ کرد و بەرەو ئیسفەهان بەڕێکەوت کەفەرماندارەکەی، کوڕی عامر بوو. کاتێك نەسر گەیشتە ڕەی، دوای دوو ڕۆژ نەخۆش کەوت بەشێوەیەك کەهەڵیان دەگرت وبۆ ئەم لاولایان دەبرد. کاتێك گەیشتە ساوە، مرد و کاتێك مرد، هاوەڵانی بەرەو هەمەدان بەڕێکەوتن.

مردنی ئەو، دوای دوانزە شەو لەرەبیع الاول/ ٩ نۆڤەمبەری ٧٤٨ زایینی بوو.

ساڵەکانی ژیانی ٨٥ ساڵ درێژەی کێشا. دەڵێن: کاتێك نەسر بەرەو رەی بەرێکەوت، نەڕۆشتە ناو شارەکە بەڵکو لەبیابانی نێوان رەی و هەمەدان دابەزی و لەوێ، مرد.

## ڕۆشتنی قەحتەبە بۆ رەی

کاتێك نەسر کوڕی سەیار مرد، حەسەن کوڕی قەحتەبە، خەزیمە کوڕی خازمی بۆ سمنان ڕەوانە کرد. قەحتەبە لەگورگانەوە بەرێکەوت و زیاد کوڕی زوارەی قوشێری لەپێش خۆیەوە نارد. ئەو لەشوێنکەوتنی ئەبوموسلیم، پەشیمان ببوویەوە. لەبەر ئەمە چیتر هاوکاری قەحتەبەی نەکرد و رێگەی ئیسفەهانی گرتەبەر تا لای عامر کوڕی زوبارە، نیشتەجێ ببێت. قەحتەبە، موسەییب کوڕی زوهەیری زەببی ڕەوانە کرد کە بۆ بەیانی لای ئێوارێ، پێی گەیشتەوە و رووبەرووی یەکبوونەوە. زیاد شکستی خوارد و هەموو شەڕکەرەکانی کوژران. موسەییب کوڕی زوهەیر بۆ لای قەحتەبە گەڕایەوە.

قەحتەبە بەرەو قومس بەرێکەوت کەفەرمانداری‌ەکەی حەسەنی کوڕی بوو. خەزیمە کوڕی خازم ڕۆشتە سمنان و قەحتەبە، حەسەنی کوڕی، بۆ رەی نارد. حەبیب کوڕی بوودەیلی نەشهەلی و هاورێکانی لەخەڵکی شام، ئاگادار بوونەوە کەحەسەن هێرشی کردۆتە سەر ئەو دیارە. ئەوان لەڕەی ڕۆشتنەدەر و حەسەن لەمانگی سەفەر/ ئۆکۆتبەری ٧٤٨ زایینی، ڕۆشتە ناو شارەکە و تاهاتنی باوکی، لەوێ، مایەوە. کاتێك قەحتەبە گەیشتە رەی، نامەی بۆ ئەبوموسلیم نووسی و لەرووداو و پێشهاتەکان ئاگاداری کردەوە.

کاتێك عەباسییەکان لەشاری رەی دەسەڵاتیان بەهێز و زیادی کرد، زۆرینەی خەڵکەکەی هەڵاتن لەبەر ئەوەی سوفیانی بوون و ئاویان دەرشتە ناو ئاشی ئومەوییەکان. ئەبوموسلیم فەرمانیدا زەوی و سامان و ماڵەکانی ئەوان داگیر و تاڵان بکەن. کاتێك لەحەج گەڕانەوە، لەساڵی ١٣٢/ ٧٤٩- ٧٥٠ زایینی لەکوفە مانەوە و دواتر نامەیان بۆ سەفاح نووسی و لەستەمی ئەبوموسلیم، سکاڵایان کرد. سەفاح فەرمانیدا تا سامان و ماڵەکانیان بۆ بگێڕنەوە. ئەبوموسلیم وەڵامی دایەوە و ئەوی لەزیانەکانی ئەوان ئاگادار کردەوە و نووسی کەخراپترینی دوژمنەکان، ئەمانەن. سەفاح گوێی لەوتەکانی نەگرت و ئەبوموسلیمی سوێندا تا سامانەکانیان بۆ بگێڕێتەوە. ئەبوموسلیم، ئەو کارەی کرد.

کاتێك قەحتەبە ڕۆشتە ناو شاری رەی، لەوێ مایەوە و بەوشیاری و وردبینییەوە،

چاودێری بارودۆخ و کاروبارەکانی دەکرد. پاسەوانی بۆ ڕێگەکان دانا بەشێوەیەك کەس نەیدەتوانی بەبێ مۆڵەتی ئەو بڕواتە ناو شارەکە یا بڕواتەدەر. قەحتەبە لەشاری ڕەی مایەوە. ئاگاداریان کردەوە کە لەدەستبی، دەستەیەك لەخەواریج و دزەکان دەژین کەلەوێ، کۆبوونەتەوە. باوکی عەونی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد. باوکی عەون شەڕی لەگەڵ ئەوان دەسپێکرد و پێشنیاری ڕازی بوون بەفەرمانەکانی خواوەند و فەرمانبردن لەفەرمانەکانی بنەماڵەی پێغەمبەری، پێکرد. بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون و شەر دەستی پێکرد. باوکی عەون بەسەریاندا سەرکەوت. ژمارەیەك لەوان لەناو قەڵاکاندا سەنگەریان گرت و خۆیان حەشاردا تا ئەو کاتەی باوکی عەون، ئەمانی پێبەخشین و هاتنەدەر. دەستەیەکیان پەیوەستی بوون و دەستەیەکیان ڕوویان لەناوچەکانی دیکە کرد.

ئەبوموسلیم نامەی بۆ سوپاسالاری تەبەرستان نووسی و پێشنیاری فەرمانبەری و پێدانی باجی پێکرد. ڕازی بوو. نامەیەکی هاوشێوەی بۆ مەسمەغان فەرمانڕەوای دۆنباوەند نووسی و وەڵام هاتەوە: تۆ کەسێکیت لەخەواریج و بەم زوانە لەناو دەچیت.

ئەبوموسلیم تووڕە بوو و نامەی بۆ موسا کوڕی کەعب نووسی و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر دۆنباوەند و شەڕ لەگەڵ مەسمەغان بکات تا ئەو کاتەی بەفەرمانەکان، ڕازی دەبێت. موسا بەڕێکەوت و پەیك و پەیامی بۆ مەسمەغان نارد بەڵام ئەو بەفەرمانبەری و پێدانی باج ڕازی نەبوو. موسا گەمارۆی خستە سەر بەڵام نەیتوانی هیچ کارێك بکات چوونکە سەرزەمینەکەی ئەو لەشوێنێکی تەنگەبەر و بەهێزدا جێگیر و ڕێگا بۆ پەڕینەوە دژوار بوو. مەسمەغان، ڕۆژانە دەستەیەك لەدەیلەمییەکانی بۆ شەڕی ئەوان دەناردەدەر و لەناو لەشکرگەکەی موسا کوڕی کەعب، شەڕیان تاقیدەکردەوە. ڕێگاکانی بەست و ڕێگەی نەدا خواردەمەنی و کەل و پەلە پێویستەکانیان پێبگات. کوژراو و بریندارەکان لەناو سوپاکەی موسا کوڕی کەعب، زیادی کرد.

کاتێك موسا زانی ناتوانێت بەمەبەستەکەی بگات، بۆ ڕەی گەڕایەوە. مەسمەغان تارۆژگاری مەنسوری تا دیناری، بەهێز بوو. مەنسور سوپایەکی گەوری بەفەرماندەیی حیماد کوڕی عەمرۆ، بۆ شەڕی ئەو، ڕەوانە کرد کەدۆنباوەند لەسەر دەستی ئەم فەرماندەیە، دەستی بەسەردا گیرا.

کاتێك نامەی قەحتەبە بە ئەبوموسلیم گەیشت و ئاگاداری کردەوە کە لەشاری ڕەی

دابەزیوە، ئەبوموسلیم (بەوتەی هەندێك كەس) لەوێ كۆچی كرد و بەرەو مەرو بەرێكەوت و لەنەیشابوور، نیشتەجێ بوو.

قەحتەبە، كوڕەكەی، دوای سێ ڕۆژ مانەوە لەشاری ڕەی، بۆ هەمەدان نارد. كاتێك رووی كردە ئەو دیارە، مالید كوڕی ئەدهەم و خەڵكانی شام و خوراسانییەكانی نیشتەجێی هەمەدان، شارەكەیان چۆڵ و بەرەو نەهاوەند بەرێكەوتن. ژمارەیەكی زۆر لەخەڵكان لێی جیابوونەوە و حەسەن ڕۆشتە ناو هەمەدان و لەوێوە بەرەو دۆنباوەند بەرێكەوت و لەچوار فەرسەخی شارەكە، دابەزی. قەحتەبە، باوكی جەهمی لەگەڵ حەوتسەد شەڕكەر، بۆ هاوكاری كردنی كوڕەكەی، ڕەوانە كرد. مانەوەی درێژەی كێشا و بەدەوری شارەكەدا سووڕایەوە و گەمارۆی خستە سەر ئەوان.

## كوژرانی عامر كوڕی زوبارە

ڕۆشتنی قەحتەبە بۆ ئیسفەهان

هۆكاری كوژرانەكەی ئەمە بوو: كاتێك عەبدوالله كوڕی معاویە كوڕی عەبدوالله كوڕی جەعفەر، لەكوڕی زوبارە شكستی خوارد، رووی كردە خوراسان و لەرێگەی كرمانەوە بەرەو ئەو شارە بەرێكەوت. عامر شوێنی كەوت. هەواڵی كوژرانی نوباتە لەگورگان بەكوڕی هوبەیرە گەیشت. نامەی بۆ كوڕی زوبارە و كوڕەكەی خۆی یەزید كوڕی عومەر كوڕی هوبەیرە نووسی تا بۆ شەڕی قەحتەبە بەرێبكەون. ئەم دووانە لەكرمان بوون. لەگەڵ پەنجا هەزار پیاوی شەڕكەر بەرێكەوتن و لەئیسفەهان دابەزین. بەسوپاكەی ئەمان دەوترا (سوپای سوپاكان).

قەحتەبە ژمارەیەك لەفەرماندەكانی بەسەركردایەتی موقاتیل كوڕی حەكیمی عەكی، بۆ ڕووبەروو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە كرد. ئەوان بەرێكەوتن ولەقوم، دابەزین.

كوڕی زوبارە ئاگادار بوویەوە كەحەسەن كوڕی قەحتەبە لەنەهاوەند دابەزیوە تا هاوكاری مەروانییەكانی ئەو شارە بكات. عەكی لەقومەوە پەیامی بۆ قەحتەبە نارد و لەمكارە، ئاگاداری كردەوە. قەحتەبە لەشاری ڕەی، بەرێكەوت و پەیوەستی موقاتیل كوڕی حەكیمی عەكی بوو. دواتر بەرێكەوت. ئەوان و كوڕی زوبارە و داوود كوڕی یەزید كوڕی هوبەیرە بەرێكەوتن. ژمارەی سوپاكەی قەحتەبە بیست هەزار كەس بوو كەخالید

بەرمەکی لەناویاندا دەبینرا. ژمارەکەی سوپاکەی کوڕی زوبارە سەد یا سەد و پەنجا هەزار کەس مەزندە دەکرا.. قەحتەبە فەرمانیدا و قورئانیان کردە بەسەری ڕمەکانەوە: دواتر جاڕیاندا: ئەی خەڵکانی شام، پێشنیار دەکەین ئەم نووسراوە لەنێوان ئێمەدا داوەر بێت. بەڵام بەجوێن و قسەی ناشیرین وەڵامیان دایەوە.

قەحتەبە فەرمانی هێرشی بەشەڕکەرانی خۆیدا. شەڕێکی ئەوتۆیان نەکرد بەڵام سوپاکەی شام شکستی خوارد و کوشتار کران. کوڕی زوبارە بۆ ناو لەشکرگەکەی خۆی هەڵات و قەحتەبە شوێنی کەوت. کوڕی زوبارە دابەزی و هاواری کرد: لەدەوری من کۆببنەوە، لەدەوری من کۆببنەوە. بەڵام خەڵك بڵاوەیان لێکرد. داوود کوڕی هوبەیرە هەڵات و سەبارەت بەکوڕی زوبارە پرسیاری کرد. وتیان: هەڵات. وتی: خوا لەنێوان من و ئەو، ئەو کەسە نفرین بکات کەخراپترین شوێنی گەڕانەوەی هەیە. بۆ گۆڕپانی شەڕ گەڕایەوە و شەڕی کرد، تا کوژرا.

لەشکرگەکەی ئەویان تاڵان و ژمارەیەکی زۆر لەکەرەستەی شەڕ و خواردەمەنی و چوارپێیان دەستکەوت. نەبیستراوە سوپایەك تاڵان بکرێت کەبەم ئەندازەیە سامان و تاڵانی تیا بێت. بەرادەیەك شەراب و تەپڵ و تەبیرەیان بینی کەنەیانتوانی بیژمێرن.

قەحتەبە هەواڵی سەرکەوتنی خۆی بۆ کوڕی حەسەن (کە لەنەهاوەند نیشتەجێ بوو) نووسی. ئەم شەڕە لەمانگی ڕەجەب/ مارسی ٧٤٩ زایینی روویدا.

## شەڕی قەحتەبە لەگەڵ خەڵکانی نەهاوەند

### گرتنی نەهاوەند

کاتێك کوڕی زوبارە کوژرا، قەحتەبە هەواڵی سەرکەوتنی خۆی بۆ حەسەنی کوڕی نووسی کەگەمارۆی خستبووە سەر نەهاوەند. کاتێك نامەکەی باوکی بەدەست گەیشت، خۆی و سوپاکەی تەکبیریان وت و کوژرانی کوڕی زوبارەیان بەدەنگی بەرز هێنایە سەرزمان. عاسم کوڕی عومەیری سەعدی وت: ئەوان هەواڵی مەرگی ئەویان جاڕنەدا مەگەر ئەوەی لەکوژرانی ئەو دڵنیا بووبێتن. خۆتان تەسلیم بەحەسەن کوڕی قەحتەبە بکەن چوونکە توانای خۆڕاگریتان لەبەردەم سوپاکەی ئەودا نییە. بۆ هەر شوێنێك دەخوازن، کۆچ بکەن پێش ئەوەی باوکی بگات و بەشەڕکەرە پشتیوانەکان، هاوکاری

کوڕەکەی بکات.

پیادەکان وتیان: ئێوە سوار لەسەر ئەسپ دەڕۆن و ئێمە بەجێدەهێڵن؟ مالك کوڕی ئەدهەمی باهلی پێی وت: ناڕۆم تا ئەو کاتەی قەحتەبە دەگات.

قەحتەبە بیست ڕۆژ لەئیسفەهان مایەوە. دواتر بەڕێکەوت ولای کوڕەکەی لەنەهاوەند دابەزی وبۆ ماوەی سێ مانگ گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی: شەعبان، ڕەمەزان و شەوال/ ئاوریل، مەی و ژوئەنی ٧٤٩ زایینی. کەشکەنجیرەکانی هەڵبەست و کەسانێکی بۆ لای خوراسانییەکانی نیشتەجێی نەهاوەند نارد و ئەمانی پێبەخشین. بەڵام پێشنیارەکەی پشتگوێ خرا و خوراسانییەکان، گرنگیان پێنەدا.

ئەم پەیامەی بۆ خەڵکانی شام ڕەوانە کرد. وەڵامیان دایەوە و بەئەمانەکەی رازی بوون. کەسیان ڕەوانە کرد و پەیامیاندا خەڵکی شارەکە بەشەڕ کردن سەرقاڵ بکات بۆ ئەوەی دەروازەی گەڕەکەکەی خۆیان بکەنەوە. قەحتەبە شەڕی دەستپێکرد و خەڵکانی شام، دەروازەکەی خۆیان کردەوە. کاتێك خوراسانییەکان ئەمەیان بینی، سەبارەت بەهۆکاری ڕۆشتنی خەڵکانی شام پرسیاریان کرد. لەوەڵامدا وتیان: ئەمانمان بۆ خۆمان و ئێوە وەرگرت. سەرکردەکانی خوراسان هاتنەدەر. قەحتەبە هەرکام لەوانی تەسلیم بەیەکێك لەفەرماندەکانی کرد و دواتر فەرمانیدا جاڕ بدەن: هەرکەس ئەسیری لەدەستدایە، بیکوژێت و سەرەکەی بۆ ئێمە بێنێت. ئەو کارەیان کرد و هیچ کام لەهەڵاتوان نەمایەوە مەگەر ئەوەی لەو ڕۆژەدا کوژرا جگە لەخەڵکانی شام کەقەحتەبە ڕێزی لەپەیمانەکەی خۆی گرت و ئازادی کردن بەڵام سوێندی لێ وەرگرتن کە کەس بۆ دوژمنایەتی کردنی ئەوان، هاننەدەن. کەسی لەوان نەکوشت.

## گرتنی شارەزوور

قەحتەبە باوکی عەون عەبدمەلیك کوڕی یەزیدی خوراسانی و مالك کوڕی تورافەی خوراسانی بەسوپایەکی چوار هەزار کەسی، بۆ شارەزووی ڕەوانە کردن کەفەرماندارەکەی عوسمان کوڕی سوفیان بوو. فەرماندەیی پێشەنگەکان بە عەبدوالله کوڕی مەروان سپێردرا بوو. ئەوان لەبیستی زیحەجەی/ ١٠ ژوئیەی ٧٤٩ زایینی لەدوو فەرسەخی شارەزوور دابەزین و شەو و ڕۆژێك دوای دابەزین، ڕووبەڕووی عوسمان بوونەوە. عوسمان

و سوپاکەی شکستیان خوارد و خۆی کوژرا و باوکی عەون لەسەرزەمینی موسڵ نیشتەجێ بوو.

دەستەیەك دەڵێن: عوسمان نەکوژرا بەڵکو هەڵات و پەنای بۆ عەبدوڵڵە کوڕی مەروان برد. باوکی عەون لەشکرگەکەی تاڵان و شەڕکەرانی کوشت. قەحتەبە سوپایەکی بۆ هاوکاری کرنی ئەو نارد کە لەسی هەزار شەڕکەر پێکدەهاتن.

کاتێك هەواڵی سەرکەوتنی باوکی عەون بەمەروان کوڕی محەممەد گەیشت، (ئەو لەحەران بوو) لەوێوە، هاورێ لەگەڵ سوپای خەڵکانی شام و جەزیرە و موسڵ بەرێکەوت. ئومەوییەکان بەگشتی هاورێیەتیان کرد. بەرەو سوپاکەی باوکی عەون پێشڕەوی و لەزابی گەورە دابەزی. باوکی عەون پاشماوەکانی زیحەجەی ١٣١ و موحەرەمی ١٣٢/ ژوئیە- ئوتی ٧٤٩ زایینی، لەشارەزوور بەسەر برد.

## بەرێکەوتنی قەحتەبە بۆ هێرش کردن سەر کوڕی هوبەیرە لەعێراق

کاتێك داوود کوڕی هوبەیرە هەڵات وبۆ لای باوکی گەڕایەوە، یەزید لەگەڵ سوپایەکی بێ ژمار، بۆ هێرش کردنە سەر قەحتەبە بەرێکەوت و حەوسەرە کوڕی سوهەیلی باهلی هاورێیەتی دەکرد. مەروان ئەوی بۆ هاوکاری کوڕی هوبەیرە ناردبوو. کوڕی هوبەیرە بەرێکەوت تا لەجەلەولای وەقیعە دابەزی و سەنگەرەکانی دووبارە هەڵکەندەوە کەئێرانییەکان لەرۆژی شەڕی جەلەولا لەبەرابەر عەرەبەکان هەڵیان کەندبوو. لەوێ مایەوە. قەحتەبە بەرێکەوت تا لەقرماسین دابەزی. دواتر بەرەو حیلوان و لەوێوە رووی کردە خانەقین و ڕۆشتە عێکبرا و لەدیجلە پەڕییەوە و ڕۆشت تا گەیشتە ئەنبارە. کوڕی هوبەیرە لەگەڵ هاوەڵانی رووی کردە کوفە تا رووبەرووی قەحتەبە ببێتەوە. حەوسەرە لەگەڵ پانزە هەزار شمشێر وەشێن ڕۆشتە ناو شاری کوفە.

دەستەیەك دەڵێن حەوسەرە لەکوڕی هوبەیرە جیا نەبوویەوە.

قەحتەبە دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بۆ ئەنبار و شوێنەکانی دیکە ڕەوانە کردو فەرمانی پێدان هەموو کەشتییەکان بۆ دێمما ببەن تا لەفورات بپەڕنەوە. هەموو کەشتییەکانیان برد. قەحتەبە لەدێمماوە فوراتی بڕی و بەرەو رۆژئاوا بەرێکەوت. دواتر رووی کرد کوفە و ئەو شوێنەی کوڕی هوبەیرە، ئورودوی لێدا بوو. لەم کاتەدا، ساڵ کۆتایی پێهات.

بیر کردنەوەی چەند ڕووداوێك

وەلید کوڕی عوروە کوڕی محەممەد کوڕی عەتییەی سەعدی لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کاتێك وەلید ئاگادار بوویەوە کەمامی یانی عەبدمەلیکیان کوشتووە، هێرشی کردە سەر بکوژەکانی و تۆڵەی لێسەندنەوە بەشێوەیەك کەسکی ژنانی هەڵدەدڕی و منالەکانی سەردەبڕی، ئەوەی کەوتە بەردەستی بەئاگر سووتاندی و هەموو شوێنێکی لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد.

یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە، فەرمانڕەوایەتی عێراقی دەکرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، حەجاج کوڕی عاسمی موحاربی و دامەزراوی دادی بەسرە، عیباد کوڕی مەنسوری ناجی.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: مەنسور کوڕی مەعمەری سولەمی (باوکی عەتابی کوفی)، جەبەلە کوڕی ئەبی داوودی عەتکی موالی ئەوان (برای عەبد عەزیز کوڕی داوود) بەنازناوی باوکی مەروان کە ئەبوموسلیم ئەوی سەربڕی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و بیست و دووی کۆچی ((٧٤٩- ٧٥٠ زایینی)

### لەناچوونی قەحتەبە

شکستی کوڕی هوبەیرە

لەم ساڵەدا قەحتەبە کوڕی شەبیب لەناوچوو.

هۆکاری لەناوچوونەکەی: قەحتەبە لەفوڕات تێپەڕی کرد و گەیشتە کەنارەکانی ڕۆژئاوا وئەم ڕووداوە دوای تێپەڕینی هەشت ڕۆژ لەمانگی موحەرەم/ ٢٧ ئوتی ٧٤٩ زایینی ڕوویدا. کوڕی هوبەیرە لەم کاتەدا لەسەر لێواری فوڕات لەپانتاییەکانی فەلوجەی سەرەوە و لەبیست و سێ فەرسەخی کوفە، ئوردوی لێدا. هەڵاتوانی سوپاکەی کوڕی زوبارە لەدەوری کۆبوونەوە. مەروان حەوسەرەی باهلی بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد.؟ حەوسەرەی باهلی و کەسانی دیکە بەکوڕی هوبەیرەیان وت: قەحتەبە مەبەستی هێرش کردنە سەر کوفەی هەیە، تۆ بەرەو خوراسان بەرێکەوە و ئەو بۆ مەروان ومەروان بۆ ئەو بەجێبێڵە چوونکە تۆ، شکستی پێدەهێنێت و ئەو بەناچار، شوێن تۆ دەکەوێت. وتی: هەرگیز دەستبەرداری کوفە نابێت و شوێن من ناکەوێت. بۆچونی پەسەند ئەوەیە پێش ئەو، بگەمە شاری کوفە. ئەو لەمەداینەوە لەدیجلە تێپەڕی و بەرەو کوفە، بەرێکەوت. فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی، بەحەوسەرە سپارد و فەرمانی پێدا بەرەو فورلات ئەسپ غار بدات.؟ هەر دوولای شەڕکەر لەسەر کەنارەکانی فورات چاوەڕوانی یەکتریان دەکرد. قەحتەبە وتی: ڕێبەر فەرمانی پێداوم کە لەم شوێنەدا شەڕێك ڕوودەدات و سەرکەوتن، ئامێز بۆ ئێوە دەکاتەوە.

قەحتەبە لەجەبارییە دابەزی و خەڵك بۆ سەر ئاوێك، ڕێنوێنیان کرد. لەئاوەکە تێپەڕی و لەگەڵ حەوسەرەی باهلی و محەممەد کوڕی نوباتە، شەڕی ئەزمون کرد. خەڵکانی شام شکستیان خوارد و خوراسانییەکان قەحتەبەیان ون کرد. هاوەڵانی وتیان: هەرکەس فەرمانێکی لەلایەن قەحتەبەوە پێدراوە، ئێمەی لێ ئاگادار بکاتەوە. موقاتیل کوڕی مالکیو عەتکی وتی: بیستم کەقەحتەبە دەیوت: ئەگەر، بەلایەك بەسەر مندا هات،

حەسەنی کوڕم فەرماندەی ئێوە بێت.

خەڵك بۆ حەسەن کوڕی قەحتەبە لەگەڵ براکەی حەمید کوڕی قەحتەبە، بەیعەتیان کرد. باوکی، ئەوی بۆ شەڕ لەناوچەیەك ڕەوانە کردبوو. کەسیان بۆ لای ئەو ڕەوانە و کاروبارەکانیان بەو سپارد.

کاتێك قەحتەبەیان ون کرد، بەدوایدا گەڕان و ئەویان لەناو جۆگەیەك دۆزییەوە. لەتەنیشت ئەوە، حەرب کوڕی سالم کوڕی ئەحوەز دۆزرایەوە. هەردوو گیان کوژرا بوون. گومانی ئەوەیان کرد کەیەکتریان کوشتبێت.

دەستەیەك دەڵێن: مەعن کوڕی زیادە لەکاتی تێپەڕینی قەحتەبە لەفورات، شمشێری لەشادەماری ملیدا و کەوتە ناو ئاوەکە. ئەویان هێنایەدەر. وتی: کاتێك مردم، هەردوو دەستم ببەستنەوە و بمخەنە ناو ئاوەکە بۆ ئەوەی خەڵکان لەکوژرانی من ئاگادار نەبنەوە.

خوراسانییەکان شەڕیان کرد و محەممەد کوڕی نوباتە شکستی خوارد و قەحتەبە مرد و پێش مەرگی خۆی، وتی: کاتێك ڕۆشتنە ناو کوفە، وەزیری بنەماڵەی محەممەد، باوکی سەلەی خەلال بێت، ئەم کارە بەو بسپێرن.

دەستەیەك دەڵێن: قەحتەبە لەناو ئاودا خنکا.

کاتێك حەوسەرەی باهلی و کوڕی زوبارە شکستیان خوارد، پەیوەستی کوڕی هوبەیرە بوون و کوڕی هوبەیرە لەزیانی شکستی ئەوان، شکستی خوارد و هەڵات. هەموویان روویان لەواست کرد و لەشکرگەکەی خۆیان و سامان و کەرەستەکانی شەڕیان لەناو گۆڕەپانی شەڕدا، بەجێهێشت. کاتێك حەسەن کوڕی قەحتەبە کاروبارەکانی گرتەدەست، فەرمانیدا، سامان و کەرەستەکانی ناو گۆڕەپان و لەشکرگەی کوڕی هوبەیرە، کۆبکەنەوە.

دەستەیەك دەڵێن: حەوسەرە لەکوفە بوو کەهەواڵی شکستی کوڕی هوبەیرەیان پێدا و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی، پەیوەستی بوو.

## هاتنەدەرەوەی محەممەد کوڕی خالید بەجل وبەرگی ڕەش لەکوفە

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی حالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسری بەئالا و جل و بەرگی ڕەش لەکوفە شۆڕشی دەستپێکرد و کارگوزاری کوڕی هوبەیرەی لەشارەکە، دەرپەڕاند.

دواتر حەسەن کوڕی قەحتەبە هاتە ناو شارەکە.

محەممەد کوڕی خالید شەوی عاشورا/ ٢٩ ئوتی ٧٤٩ زایینی بەئالآ و جل و بەرگی ڕەش بزوتنەوەکەی خۆی دەستپێکرد. فەرمانداری کوفە، زیاد کوڕی سالّحی حارسی و فەرماندەی پاسەوانەکانی، عەبدولرەحمان کوڕی بەشیری عیجلی بوو. محەممەد بەرەو کۆشکی فەرمانداری بەرێکەوت. زیاد و هاورێکانی لەخەڵکانی شام، کۆشکی فەرمانداریان بەجێهێشت و محەممەد ڕۆشتە ناو کۆشکەکە. حەوسەرە، ئەم هەواڵەی بیست و بەرەو کوفە بەرێکەوت. کاتێك ئەم هەواڵە بەهاوەڵانی محەممەد گەیشت، زۆرینەیا جیابوونەوە و تەنیا ژمارەیەکی کەم لەخەڵکانی شام، لەگەڵی مانەوە. لەخەڵکانی یەمانیش، ئەوانەی لەدەوری مەروان بلآوەیان کردبوو، لەدەوری مانەوە و کۆیلەکانی لەبەردەم ئەودا وەستا. باوکی سەلەی خەلال (کەهێشتا ئاشکرا نەببوو) پەیامی بۆ محەممەد نارد تا لەکۆشکەکە بڕواتەدەر. ئەو لەحەوسەرە و هاوەڵانی دەترسا. هێشتا هیچ کامیان هەواڵی مەرگی قەحتەبەیان نەبیستبوو. محەممەد بەپێشنیاری ڕۆشتنەدەر لەکۆشك، ڕازی نەبوو. حەوسەرە ئاگادار بوویەوە کەهاوەڵانی محەممەد لەدەوری بلآومیان کردووە، لەبەر ئەمە بۆ هێرش کردنە سەر ئەو، بەرێکەوت.

کاتێك محەممەد لەناو کۆشکدا بوو، یەکێك لەپێشەنگەکانی هاتە لای ئەو و وتی: سوپای خەڵکانی شام نزیك بوونەتەوە. ئەو دەستەیەك لەکۆیلەکانی خۆی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد. خەڵکانی شام، هاواریان کرد: ئێمە لەخەڵکانی بەجیلەیین و مەلیح کوڕی خالیدی بەجلی، لەناو ئێمەدایە، هاتووین تا بەفەرمانی گوێرایەڵی خۆمان بۆ فەرمانەکانی سەروەر دەربڕین. ئەوان ڕۆشتنە ناو شارەکە. دواتر سوپایەکی گەورەتر هات کەجەهم کوڕی ئەسفەحی کەنانی لەناو ئەواندا دەبینرا. دواتر سوپایەکی گەورەتر هات و پیاوێك لەبنەماڵەی بەجدەل، لەناویاندا بوو. کاتێك حەوسەرە، ئەمەی بینی، بەرەو واست کۆچی کرد. محەممەد کوڕی خالید هەمان شەو نامەی بۆ قەحتەبە نووسی چوونکە نەیدەزانی کەکوژراوە و گومانی دەکرد بەسەر کوفەدا زاڵ بووە.

پەیکی ئەو گەیشتە لای حەسەن کوڕی قەحتەبە. کاتێك نامەکەی محەممەد کوڕی خالیدی پێدا، حەسەن نامەکەی بۆ خەڵکان خوێندەوە و بەرەو کوفە بەرێکەوت. محەممەد ڕۆژی هەینی و شەممە و یەکشەممە لەکوفە مایەوە و حەسەن، ڕۆژی

دووشەممە رۆشتە ناو کوفە.

دەستەیەك دەڵێن: حەسەن کوڕی قەحتەبە دوای شکستی کوڕی هوبەیرە، رووی کردە. فەرماندارەکەی عەبدولرەحمان کوڕی بەشیری عیجلی بوو کەهەڵات. محەممە عەبدولرەحمان کوڕی خالید ئالای ڕەشی بەرز کردەوە و جل و بەرگی ڕەشی پۆشی و هاورێ لەگەڵ پانزە کەس، بەناو خەڵکاندا گەڕا و بەیعەتی وەرگرت. بەیانی ئەو رۆژە، حەسەن ڕۆشتە ناو شارەکە. کاتێك حەسەن و سوپاکەی ڕۆشتنە ناو شارەکە، باوکی سەلەیان هێنایەدەر. ئەو دوو رۆژ لەنوخەیلە ئورودوی لێدا بوو و دواتر بەرەو حەمام ئەعیەن بەرێکەوت و حەسەن کوڕی قەحتەبەی بۆ شەڕ لەگەڵ کوڕی هوبەیرە، ڕەوانە کرد. خەڵکان لەگەڵ باوکی سەلە حەفس کوڕی سلێمان موالی سەبیع (کەپێیان دەوت وەزیری بنەماڵەی محەممەد) بەیعەتیان کرد. ئەو، محەممەد کوڕی خالید کوڕی عەبدوڵڵەی وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان کرد. پێی دەوترا فەرمانڕەوا و ڕێبەر تا ئەو کاتەی باوکی عەباسی خوێنڕێژ دەرکەوت.

حەمید کوڕی قەحتەبەی لەگەڵ فەرماندەکانی دیکە، بەرەو مەداین نارد و موسەییب کوڕی زوهەیر و خالید کوڕی بەرمەکی بۆ دێرقنی و موهەلیبی و شەهراحیلی بۆ عەین تەمر و بەسام کوڕی ئیبراهیم کوڕی بەسامی بۆ ئەهواز رەوان کرد کەعەبدواحید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە، فەرمانڕەوایەتی دەکرد. کاتێك بەسام ڕۆشتە ئەهواز، عەبدواحید شارەکەی بەجێهێشت و بەرەو بەسرە، بەرێکەوت هەڵبەت ئەمە دوای شەڕ کردن لەگەڵ بەسام و شکست خواردنی بوو. بۆ بەسرە، سوفیان کوڕی معاویە کوڕی یەزید کوڕی موهەلیبی وەك فەرماندار، ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتە بەسرە کە سەلەم کوڕی قوتەیبەی باهلی بەنوێنەرایەتی لەکوڕی هوبەیرە، فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی دەکرد و عەبدواحید کوڕی هوبەیرە، پەنای بۆ بردبوو. پێشتر ئاماژەمان بەم بابەتەدا.

ئەو، سوفیان کوڕی معاویەی بۆ لای سەلەم ڕەوانە و فەرمانی پێدا لەکۆشکی فەرمانداری، بۆ ناوچەیەکی دیکە بڕوات. ئاگاداری کردەوە کە لەباوکی سەلەوە چ وەڵامێکی پێگەیشتۆتەوە. سەلەم رازی نەبوو و قەیسییەکان و موزەرییەکان و ئومەوییەکانی نیشتەجێی بەسرەی کۆکردەوە. سوفیان، هەموو خەڵکانی یەمان و هاوپەیمانەکانیان لەرەبیعە و کەسان و هۆزەکانی دیکەی، کۆکردەوە. فەرماندەیەك

لەفەرماندەکانی کوڕی هوبەیرە هاتە لای ئەوان کە لەگەڵ دوو هەزار پیاوی شەڕکەر لەخەڵکانی کەلب، بۆ هاوکاری سەلەم، ڕەوانە کرابوو. سەلەم ڕۆشتە ناو بازاری وشتر فرۆشەکان و سوارەکانی بۆ کۆڵانەکانی بەسرە نارد و جاڕیدا: هەرکەس، سەرێکی بڕاو بێنێت، پێنسەد درەمی پێدەبەخشم و هەرکەس ئەسیرێك بێنێت، هەزار درەم.

معاویە کوڕی سوفیان کوڕی معاویە لەگەڵ خەڵکانی ڕەبیعە و کەسە نزیکەکانی خۆی بەرێکەوت. سوارەکانی تەمیم ڕووبەڕووی بوونەوە. معاویە کوژرا و سەری ئەویان بردە لای سەلەم. فەرمانیدا بەبکوژەکەی، دەهەزار درەم ببەخشن. سوفیان لەڕەنجی کوژرانی کوڕەکەی شکستی خوارد و هەڵات. دوای ئەوە لەلایەن مەروانی کەرەوە چوار هەزار شەڕکەر بۆ هاوکاری سەلەم گەیشتن. مەبەستی ئەوەیان کردە پاشماوەی سوپاکەی ئەو (سوفیان) تالآن بکەن. شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و ژمارەی کوژراوەکان فراوان بوو. خەڵکانی ئەزد شکستیان خوارد و ماڵەکانیان تالآن کرا و ژنەکانیان ئەسیر. هێرشبەران بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەتالآن کردن و وێران کردنی ماڵەکانەوە سەرقاڵ بوون. سەلەم لەبەسرە مایەوە تا ئەو کاتەی هەواڵی کوژرانی کوڕی هوبەیرەی پێگەیشت. لەم کاتەدا، شارەکەی بەجێهێشت. دانیشتوانی بەسرە لەبنەماڵەی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب لەدەوری محەممەد کوڕی جەعفەر کۆبوونەوە و ئەویان وەك ڕێبەری خۆیان هەڵبژارد. بۆ چەند ڕۆژێك فەرمانڕەوایەتی ئەوانی کرد تا ئەوەی باوکی مالك عەبدوالله کوڕی ئەسیدی خوزاعی بەنوێنەرایەتی ئەبوموسلیم هاتە ناو شارەکە. کاتێك باوکی عەباسی خوێنڕێژ دەرکەوت، سوفیان کوڕی معاویەی وەك فەرمانداری شارەکە دەستنیشان کرد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەروان، وەلید کوڕی عوروەی لەفەرمانڕەوایەتی مەدینە لابرد و براکەی، یوسف کوڕی عوروەی لەمانگی ڕەبیع الاول/ نۆڤەمبەری ٧٤٩ زایینی، وەك فەرمانداری ئەو شارە دیاریکرد.

لەم ساڵەدا فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی ئومەویی لەئیمپراتۆری ئیسلامی، ڕووخا.

## دامەزرێنەرانی فەرمانڕەوایی عەباسییەکان

### بەیعەت لەگەڵ باوکی عەباسی خوێنڕێژ

لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاوەل/ ئۆکتۆبەری ٧٤٩ زایینی لەگەڵ باوکی عەباس عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، وەك خەلیفە، بەیعەتیان بەست. دەڵێن: ١٣ رەبیع الاوەل/ ٣٠ ئۆکتۆبەری ٧٤٩ زایینی بوو. دووبارە دەڵێن: لەجەمادی الاوەل/ دێسامبەری ٧٤٩ زایینی، بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

سەرەتای کارەکە بەم شێوە بوو کە پێغەمبەر(د.خ)، عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی ئاگادار کردەوە کەخەلافەت بەمناڵەکانی ئەو دەگات. دوای ئەوە، بەردەوام مناڵەکانی ئەو، چاوەڕوانی فەرمانڕەوایەتیان دەکرد و سەبارەت بەم کارە، لەناو خۆیاندا راوێژ و گفتوگۆیان دەکرد.

باوکی هاشم کوڕی حەنیفە بەرەو شام بەرێکەوت و محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی بینی و پێی وت: ئەی کوڕی مام، زانستێك لای منە و بۆ تۆی باس دەکەم و هیوادارم کەسی لێ ئاگادار نەکەیتەوە: ئەم کارەی خەڵکان چاوەڕێی دەکەن، بەدەستی ئێوە دەگات: وتی: زانیم، هەرگیز کەسی لێ ئاگادار نابێتەوە.

لەگێڕانەوەی کوڕی ئەشعەس ئاماژەی پێدراوە کەخالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە بە عەبدولمەلیك کوڕی مەروانی وت: کاتێك ئاژاوەکان لەپانتایی سیستانەوە سەر هەڵبدات، مەترسی بۆ تۆ نییە، بەلاَم ئەگەر لەخوراسانەوە بێت، بەردەوام دەبێت بترسین.

محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله وتی: ئێمە سێ کاتی دیاریکراومان هەیە: مەرگی یەزید کوڕی معاویە، سەد ساڵی و تێکشکانی ئەفریقییە. لەم کاتەدا بانگەشەکەرانی عەباسی دەردەکەون و هاوەڵانی ئێمە، لەرۆژهەلأتەوە دەگەن تا ئەوەی سوارەکانیان لەقولایی رۆژئاوا پێشڕەوی دەکەن و گەنجینەی ستەمکاران دەهێننەدەر.

کاتێك یەزید کوڕی ئەبی موسلیم لەئەفریقییە کوژرا و بەربەرییەکان شۆڕشیان دەستپێکرد، محەممەد کوڕی عەلی کەسێکی بۆ خوراسان رەوانە و فەرمانی پێدا پێشنیاری گوێرایەڵی بنەماڵەی محەممەد بەخەڵکان بکات بەلاَم ناوی کەسی نەبرد. پێشتر ئاماژەمان بەکاروباری نێردراوان و کارەکانی ئەبوموسلیم، دا و وتمان کەمەروان، ئیبراهیم

کوڕی محەممەدی دەستگیر کرد. کاتێك مەروان پیاوی دەستبەسەری ڕەوانە کرد، نیشانەکانی باوکی عەباسی بەنێردراوەکەیدا چوونکە لەنوسراوەکاندا بەمشێوەیە بینیبووی: کەسێك کەفلان و فیسارە تایبەتمەندی هەیە، ئەوان کوشتار دەکات و فەرمانڕەواییان لێدەستێنێت. فەرمانی پێدا ئیبراهیم کوڕی محەممەد بۆ لای ئەو بێنێت.

نێردراو هات و باوکی عەباسی بەنیشانە و تایبەتمەندییەکانەوە ناسییەوە. کاتێك ئیبراهیم دەرکەوت و ئارامی گرت، بەنێردراو وترا: فەرمانی گرتنی ئیبراهیمت پێدراوە و ئەمە عەبدوالله‌یە. باوکی عەباسی ئازاد و ئیبراهیمی گرت و بۆ لای مەروانی برد. کاتێك مەروان، ئەوی بینی، وتی: ئەمانە ئەو تایبەتمەندی و نیشانانە نین، کەبۆم باس کردی. وتیان: نیشانە و تایبەتمەندییەکانمان لەکەسێکی دیکەدا بینی، بەلام تۆ ناوی ئیبراهیمت برد و ئەمە ئیبراهیمە. فەرمانیدا و ئەویان خستە زیندانەوە و بەدوای باوکی عەباسدا گەڕان بەلام ئەویان نەدۆزییەوە.

هۆکاری ڕۆشتنی لەحومەیمە ئەمە بوو: کاتێك نێردراو ئیبراهیمی گرت، ئەو، هەواڵی مەرگی خۆی بەکەسەکانیدا و فەرمانی پێدان لەگەڵ براکەی عەبدوالله کوڕی محەممەد بەرەو کوفە بڕۆن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو بن. وەسیەتی لای باوکی عەباس و دوای خۆی ئەوی وەك خەلیفە، دەستنیشان کرد. باوکی عەباس و کەسەکانی بۆ لای کەسەکانی ئەو بەڕێکەوتن: لەناو ئەوان: باوکی جەعفەر مەنسوری تاك دیناری، عەبدوەهاب کوڕی ئیبراهیم، محەممەد کوڕی ئیبراهیم (هەردووکیان برازای) مامەکانی، داوود کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، عیسا کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، عەبدوالله کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، عەبدولسەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، داوود (کوڕی مامی)، عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی (برازای) یەحیا کوڕی جەعفەر کوڕی تەمام کوڕی عەباس. ئەوان بەڕێکەوتن و لەمانگی سەفەر گەیشتنە کوفە. شیعەکانی کوفە لەخوراسانییەکان لەدەرموەی کوفە لەحەمام ئەعیەن بوون. باوکی سەلەمەی خەلال (سرکە فرۆش) ئەوانی لەماڵی وەلید کوڕی سەعید موالی بەنی هاشم لەناو بەنی داوود نیشتەجێ کرد و بۆ ماوەی ٤٠ شەو، کاروباری ئەوانی لەهەموو فەرماندەکان و شیعەکان، شاردەوە.

لەسەر بنەمای ئەوەی وتراوە، دەیویست فەرمانڕەوایەتی بەدەستی بنەماڵەی ئەبوو تالیب، بسپێرێت و کاتێك هەواڵی مەرگی ئیبراهیمی ڕێبەری پێگەیشت، لەبڕیارەکەی، دڵگەرم بوو. باوکی جەهم پێی وت: ڕێبەر چی بەسەر هات؟ وتی: هێشتا نەگەیشتوە. لەبەرابەر ئەو پێداگری کرد. وتی: ئێستا کاتی هاتنەدەرەوەی ئەو نییە چوونکە هێشتا واست دەستی بەسەردا نەگیراوە.

هەرجار سەبارەت بەڕێبەر لە باوکی سەلەمەی سرکەفرۆش پرسیاریان دەکرد، دەیوت: پەلە مەکەن. بەم شێوەیە بوو تا باوکی حەمید محەممەد کوڕی ئیبراهیمی حەمیری لەحەمام ئەعیەنەوە بەمەبەستی کەنانە بەرێکەوت. یەکێك لەکۆیلەکانی ئیبراهیمی ڕێبەری (بەناوی سابقی خارەزمەی) بینی، ئەوی ناسییەوە و وتی: ڕێبەر چی بەسەر هات؟. ئاگاداری کردەوە کەمەروان ئەوی کوشتووە و ئیبراهیم، خەلافەتی بەبراکەی، باوکی عەباس سپاردووە و ئەوی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردووە. باوکی عەباس لەگەڵ هەموو کەسەکانی خۆی بەرەو کوفە بەرێکەوتووە. باوکی حەمید داوای لێکرد، بیباتە لای ئەوان. سابق وتی: وادەی ئێمە بەیانی، لەم شوێنەدا بێت. سابق نەیدەویست، بێ مۆڵەت، باوکی حەمید بباتە لای ئەوان.

باوکی حەمید ڕۆشتە لای باوکی جەهم و ئاگاداری کردەوە. ئەو یەکێك بوو لەسوپاییەکانی باوکی سەلەمەی سرکەفرۆش. فەرمانی پێدا بۆ بینینی ئەوان بیر لەرێگە چارەیەك بکاتەوە. باوکی حەمید بەیانی، ڕۆشتە شوێنی دیاریکراو و سابقی بینی. سابق ئەوی بردە لای بنەماڵەی باوکی عەباس. کاتێك گەیشتە لای ئەوان، لەسابقی پرسی: خەلیفە کامەیە؟ داوود کوڕی عەلی وتی: ئەمە ڕێبەر و خەلیفەی ئێوەیە (بەدەست باوکی عەباسی نیشاندا) وەك خەلیفە سڵاوی بۆ نارد و دەست و پێی ماچ کرد. وتی: فەرمانی خۆت بفەرموو. بۆ مەرگی ئیبراهیم، دڵنەوایی کرد.

دواتر گەڕایەوە و پیاوێك بەناوی ئیبراهیم کوڕی سەلە کەخزمەتی بەنی عەباسی دەکرد، تا لای باوکی جەهم، هاوڕێیەتی کرد و لەشوێنی مانەوەی ئەوان، ئاگاداری کردەو ە. پێی وت کەرێبەری ئەوی بۆ لای باوکی سەلە ناردوە و داوای دوسەد دیناری کردووە کە بەنێردراوەکەی بدات. ئەو هیچی بۆ ئەوان نەنارد. باوکی جەهم و باوکی حەمید و ئیبراهیم کوڕی سەلە، ڕۆشتنە لای موسا کوڕی کەعب و ئەم بەسەرهاتەیان بۆ گێڕایەوە

و دووسەد دینارەکەیان بەئیبراهیم کوڕی سەلە، بۆ ڕێبەر ڕەوانە کرد. دەستەیەك لەفەرماندەکان بڕیاریاندا چاویان بەڕێبەر بکەوێت. ئەوان ڕۆشتنە لای ڕێبەر،( باوکی عەباسی خوێنڕێژ). باوکی جەهم، عەبدحەمید کوڕی ڕێبعی، سەلە کوڕی محەممەد، ئیبراهیم کوڕی سەلە، عەبدوالله تایی، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، شەراحیل، عەبدوالله کوڕی بەسام، باوکی حەمید محەممەد کوڕی ئیبراهیم، سلێمان کوڕی ئەسوەد، محەممەد کوڕی حوسەین.

باوکی سەلە لەم کارە ئاگادار بوویەوە و لەوانی پرسی. پێی وترا: ئەوان بۆ مەبەستێکی تایبەت، ڕۆشتنە کوفە. ڕۆشتنە لای باوکی عەباس و ئەو، پرسی: عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی حارسە، کام یەك لەئێوەیە؟ وتیان: ئەمە. وەك خەلیفە سلاٌویان بۆنارد و بۆ مەرگی ئیبراهیم، دڵنەواییان کرد. موسا کوڕی کەعب و باوکی جەهم گەڕانەوە. باوکی جەهم فەرمانی بەکەسانی دیکەدا لای ڕێبەر بمێننەوە. باوکی سەلە پەیامی بۆ باوکی جەهم نارد: لەکوێ بوویت؟ وتی: سوار بووم و ڕۆشتمە لای ڕێبەر. باوکی سەلە بەرێکەوت و ڕۆشتە لای ڕێبەر. باوکی جەهم پەیامی بۆ باوکی حەمید نارد: باوکی سەلە بۆ لای ئێوە بەرێکەوتووە، ناڕواتە لای ڕێبەر مەگەر ئەوەی بەتەنیا. کاتێك باوکی سەلە گەیشتە لای ئەوان، ڕێگەیان نەدا کەس لەگەڵ ئەو بڕواتە ژوور. بەتەنیایی ڕۆشتە لای باوکی عەباس و وەك خەلیفە، سلاٌوی بۆ نارد باوکی حەمید پێی وت: بەریسوایی تۆ، ئەی ئەو کەسەی ڤیتکەی دایکی خۆت دەمژیت. باوکی عەباس پێی وت: ئارام بە! فەرمانی بەباوکی سەلەدا بۆ لەشکرگەکەی خۆی بگەڕێتەوە و ئەو گەڕایەوە.

ڕۆژی هەینی دوانزەی ڕەبیع الاوەل/ ٢٩ ئۆکتۆبەری ٧٤٩ زایینی هات و خەڵکان، جل و بەرگی شەڕیان پۆشی و بۆ هاتنی باوکی عەباس ریزیان بەست و چوارپێ و مەروماڵاٌتیان کۆکردەوە. باوکی عەباس، سوار ماینێکی خۆڵەمێشی بوو و هاوەڵان و کەسانی بنەماڵەکەی سوار بوون و ڕۆشتنە ناو کۆشکی فەرمانڕەوایەتی. دواتر بەرەو مەزگەوت بەرێکەوت و نوێژی خوێند و وتارێکی بۆخەڵکان خوێندەوە. لەهەمان ڕۆژوەك خەلیفە، بەیعەتی پێدرا و ڕۆشتە سەر بەرزترین پلیکانەی تەختی وتاردان و مامەکەی داوود، سەرکەوت و لەخوار ئەو، جێگەی گرت. باوکی عەباس وتارەکەی دەست پێکرد: بەمشێوەیە:

سپاس بۆخوایەك ئیسلامی هەڵبژارد و ڕێزی لێگرد و پیرۆزی کرد و تاجی شکۆ و مەزنی کردە سەر و بۆ ئێمەی دیاری کرد و ئێمەی کردە کەسە شیاوەکانی ئەو کارە و پارێزەران و پاسەوانانی ئایینەکەی. وتاری خۆپارێزانی پەیوەستی ئێمە کرد و ئێمەی کردە کەسانی شیاو و خزمایەتی پێغەمبەری بەئێمە بەخشی و بەم خزمایەتییە، ڕێزی لێگرتین. ئێمە لەپشتی باوکە بەڕێز و ڕێزدارەکان هێنایە دنیا. پێغەمبەری(د.خ)لەناو خۆماندا هەڵبژارد بەشێوەیەك ڕەنجەکانی ئەو، بۆ ئێمە دژوار بوو. ئێمە لەناو ئیسلام و ئیسلامییەکان جێگەیەکی بەرزمان پێبڕا و لەمبارەوە نووسراوێکی بۆ ئیسلامییەکان ڕەوانە کرد کەهەمووان دەیزانن. گەورە و ڕێزدارە و ئەوەی لەنووسراوەکەی سەبارەت بەئێمە فەرموویەتی: خواوەند دەخوازێت خراپە لەبنەماڵەکەی تۆ، بسڕێتەوە و بەپاکی و خاوێنی، بتانرازێنێتەوە (ئەحزاب/ ٣٣/٣٣) خواوەند فەرموویەتی: بڵێ، لەئێوە بۆ پێغەمبەرایەتی هیچ سوود و کرێیەکم ناوێت، جگە لەهاورێیەتی و خۆشویستنی بنەماڵەکەم (شورا/ ٢٣/٤٢) و هەروەها فەرموویەتی: پێشنیاری ئیسلام بەنزیکترین کەسەکانت بکە (شعراء ٢١٤/٢٦) و هەروەها فەرموویەتی: ئەوەی خواوەند لەناو شارستانییەکان بەپێغەمبەری بەخشیوە، تایبەت بەپێغەمبەر و کەسە نزیکەکانی ئەوە (حشر/ ٧/٥٩) هەروەها فەرموویەتی: بزانن ئەوەی لەرێگەی شەڕ و ڕەنجەوە بەدەستی دێنن، پێنج یەکی تایبەت بەخواوەند و پێغەمبەر(د.خ) و کەسەکانی ئەو و هەتیوەکانە (ئەنفال/ ٤١/٨) خواوەند، لەپێشی و گەورەیی ئێمەی بیری خەڵکان خستۆتەوە و پێشنیاری چاکەکردنی لەگەڵ ئێمەدا کردووە. لەتاڵانییەکانی شەڕ و کۆیلەکان و ئەسیرەکان، بەشی ئێمەی دیاریکردووە تا ببێتە هۆکاری سەرفرازی و سەربڵندی و بێ نیازیمان. گەورەترین بەخششەکان لای خواوەندە.

سەبەئییە گومڕاکان (شوێنکەوتەکانی عەبدوڵڵە کوڕی سەبا) گومانیان کرد کەسانێك جگە لەئێمە( بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالب) بۆ سەروەری و خەلافەت شیاوترن و دەبێت ئەم کارە دژوارە لەئەستۆ بگرن. چاویان کوێر و لەبەزەیی خواوەند بەدوور بن. ئەی خەڵکینە، بۆ دەبێت بەم شێوەیە بێت! خواوەند بەئێمە، خەڵکانی لەگومڕایی ڕزگار و بەدوای نەزانی، پەروەردە و زانایی پێبەخشین. ڕاستی و دروستی بەئێمە ئاشکراو کەژی و چەوتییەکانی بەهۆی ئێمەوە، ناڕەوا کرد، ئەوەی ناڕەوا بوو، لەسەر دەستی ئێمە ڕاستی

کردەوە و بەهۆی ئێمەوە، سەروەری بەژێردەستەکان بەخشی. کەم و کورییەکانی ئێمەی لەناوبرد و دوای دوژمنایەتی کردن، هاودڵی و یەکبوونی لەناو خەڵکاندا سەقامگیر کرد. ئەم بەخششینە هەمیشەییانە بۆ هەمیشە بۆ بنەماڵەی محەممەد دەمێنێتەوە. کاتێ: خواوەند ئەوی بۆ لای خۆی بردەوە، دوای ئەو، هاوەڵانی کاروبارەکانیان گرتەدەست و بەپێی راوێژ کردن کاروبارەکانی خەڵکیان هەڵدەسووڕاند. میراتی خەڵکیان بەتەواوی بەخشی و دادپەروەریان لەستەمکاری جیا کردەوە. بەڵام دواتر زادەکانی حەرب و مەروانییەکان، بەزۆر دەستیان بەسەر تەختی خەلافەتدا گرت و لەناو خۆیاندا ئاڵو گۆڕیان پێدەکرد. ستەمکاریان کردە پیشە وخەلافەتیان تایبەت کرد بەخۆیان و زوڵمیان لەخاوەنە راستینەکانی ئەو کار کرد. دەستیان بەسەر نووسراوەکانی خواوەندا گرت کەبووە هۆی تورە بوون و بێزار بوونی. کاتێك خواوەند توورە بوو، لەسەر دەستی ئێمە تۆڵەی لەوان سەندەوە و مافەکەی، بۆ گەراندینەوە و بەهێزی خەڵکان بەهێزی کردین و سەرکەوتنی پێبەخشین تا بەهێزی ئێمە، هێز بەو کەسانە ببەخشێت کەلەزەوی هەژار و نەدارن. کارەکان بەئێمە کۆتایی دەهێنێت بەهەمان شێوە کەبەئێمە دەستی پێکرد.

هیوادارم لەو سەرچاوەی لێی دەخۆنەوە، زیان نەگات و لەوێ شوێنەی پاکی و خواپەرەستی دەبارێت، فێرۆیی روونەدات. بەختەوەری ئێمە کەبنەماڵەی پێغەمبەرین تەنیا بەهاوکاری خواوەند ئەگەری هەیە.

ئەی خەڵکانی کوفە، ئێوەمان خۆش دەوێت و رێزتان لێدەگرین. ئێوەن کەگۆڕانتان بەسەر نەهات و ستەمکاری ستەمکاران، بەلاڕێیدا نەبردن تا بەرۆژگاری ئێمە گەیشتن و خواوەند، فەرمانرەوایی ئێمەی بەئێوە بەخشی. لەبەر ئەمە ئێوە بەختەوەرترین و رێزدارترینی خەڵکان، لای ئێمەن. من بۆ بەخششەکانی ئێوە سەد درەم زیاد دەکەم. ئامادە بن چوونکە من کەسێکی خوێنرێژ و شۆڕشگێرێکم کەتەپ و تۆزی وێرانی بۆ ئاسمان بەرز دەکەمەوە.

ئەو پیاوێکی بەئازار و دەردەدار بوو. لێرەدا ئازار تەنگی پێهەڵچنی و ناچاری کرد لەسەر تەختەکە دابنیشێت. داوودی مامی هەستا و وتی: سپاس بۆ خواوەند کەدوژمنەکانی ئێمەی لەناو برد و میراتەکەی، بۆ گەراندینەو و پاشەکەوتەکانی محەممەدی بەئێمە سپارد.

ئەی خەڵکینە، ئێستاکە شەوی تاریك رووناك بۆتەوە و پەردە لەسەر راستییەکان هەڵگیرا. زەوی و ئاسمان نوورانی و هەتاوی سەرکەوتن هەڵاتوە و راستی و دروستی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، جێگیر و سەقامگیر بووە چوونکە ئەوان لەگەڵ ئێوە میهرەبان و دڵیان لێوانلێوە لەخۆشەویستی ئێوە و بەردەوام بۆ لای ئێوە، هەڵدەفڕن.

ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا بۆ کۆکردنەوەی زێر و سامانی دنیا نەهاتووین و مەبەستی هەڵکەندنی رووبار یار دروست کردنی کۆشك و تەلارمان نییە. تەنیا لەبەر ئەوە تورە و بێزار بووین کەبەزۆر مافەکانیان زەوت کردین و ئێمەیان بەبینینی چارەنووسی ئامۆزاکانمان تورەو چارەنووسی ئێوەیان تاریك کرد بەشێوەیەك نەمانتوانی خۆمان بەدوور بگرین. لەجێگادا بووین و داخمان بۆ ئێوە دەخوارد و لەخراپەکاری بنەماڵەی ئومەییە، دەسووتایین. ئەوان پێگەکانی ئێوەیان رووخاند و کرێ و مانگانەی ئێوەیان خوارد و لەمەبەستەکانتان، دووریان خستنەوە و دەسهاتەکانی ئێوەیان بەفیڕۆدا. ئێستا ئەمانی خواوەندی گەورە و ئەمانی پێغەمبەر(د.خ) و ئەمانی عەباسی باوەگەورێمان، لەئەستۆی ئێمەدایە تا بەپێی نووسراوی خواوەند، فەرمانڕەوایەتی ئێوە بکەین و لەناو کۆمەڵانی خەڵك و کۆیلەکان، دادپەروەری بکەینە پیشە. نەنگ و بێزاری خۆمان لەئومەوییەکان دەردەبڕین کە لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی خۆیان، لەپێشیان بەم جیهانە کورتە بەخشی و ستەمیان لەخەڵکان کرد و رێزیەکانیان خستە ژێرپێ و دەستیان بۆ گوناحەکان درێژ و ستەمکاریان کردەپیشە و لەناو مێرگەلانەکانی زۆرداریدا، لەوەڕان و لەگۆڕەپانەکانی نەزانیدا، ئەسپیان غاردا چوونکە نەیاندەزانی خواوەند لەسەر رێگەی ئەوان دانیشتوە و بەرەو هەڵدێریان دەبات. ئاسوودە بوون لەوەی خواوەند، بۆسە و داوی لەرێگەی ئەوان دانەنا بەڵام کاتێك تورەیی خۆی بەسەر ئەواندا باراند کەئاسوودە و لەناو جێگەدا بوون. کاتێك بەیانی بوویەوە، بۆنە داستانی سەرزاری خەڵکان و لەناو چوون. دوور بێت رۆژگاری خراپەکاران و لەناوچوو بێت بەهرەی ستەمکاران. خواوەند دادی ئێمەی لەمەروان وەرگرت چوونکە ئەو شەیتانی فریودا بوو و لەیەزدانەوە پەنای بۆ ئەهریمەن بردبوو. خواوەند هەوساری ئەو ی پچڕاند تا ئەوەی کەوتە لێواری هەڵدێری لەناوچوون و دۆزەخ بوو بەجێگەی. دوژمنی خواوەند، گومانی کرد دەستمان پێناگات وهیچ کات ناتوانین سەرکەوتن بەدەست بێنین. دەستەکانی خۆی کۆکردەوە و فێڵ و

تەڵەکەبازی کردە پیشە. لەچەپ و ڕاست و خوار و سەرەوەی خۆی، بەو ئەندازەیە بێزاری و تورە بوونی خواوەندی بینی کەگومانە پووچەکانی ئەوی مراند و گومڕایی ئەوی دامرکاند و بازنەی لەناوبردنی بەدەوری ئەودا کێشا و سەروەری، بۆ ئێمە گەڕاندەوە.

ئەی خەڵکینە، سەروەری باوەڕداران، دوای نوێژ، بۆ سەر تەختی وتاردان گەڕایەوە چوونکە نەیدەویست هیچ شتێکی دیکە تێکەڵ بەوتاری ڕۆژی هەینی بکات. بەڵام ئازار و دەرد، ڕێگەی پێنەدا کۆتایی بەوتارەکەی بێنێت.، لەخوا بپاڕێنەوە تا تەندروستی بۆ سەروەری باوەڕداران بگەڕێنێتەوە چوونکە خواوەند لەجیاتی مەروان، سەرکردەیەکی مێهرەبانی بەئێوەبەخشی و فریشتەیەکی شادمانی بۆ ئێوە ناردوە. مەروان سەرکردەی ئەو بێ سەر و پێیانە بوو کەزەوییان پیس کرد و دینی خوایان گۆڕی و ڕێزی موسوڵمانانیان پێشێل کرد. خواوەند ئەم گەنجە شیاو و لەسەر خۆیەی بەئێوە بەخشیوە. ئەو شوێنکەوتەی باوەگەورێکان و باوکە چاکەکارەکانی خۆیەتی کەزەوییان بەرەو رزگاری برد و نیشانەکانی رزگاربوونیان، هەڵکرد وشێوازەکانی خواپەرەستیان زیندوو کردەوە.

خەڵك هاواریان کرد و لەخوا پاڕانەوە. دواتر وتی:

ئەی خەڵکانی کوفە، سوێند بەخوا بەردەوام سەرکوتکراو و ستەملێکراو بووین. مافی ئێمەیان بەزۆر زەوت کرد تا ئەو کاتەی خواوەند شیعەکانی لەخوراسانەوە راسپارد و بەهرەی ئێمەیان زیندوو کردەوە و فەرمانڕەوایی ئێمەی بەهێزی ئەوان، بەهێز کرد. خوا چاکەی زۆری لەگەڵ کردوون کەچاوەڕێتان نەدەکرد و فەرمانڕەوای ئێوەی لەبنەماڵەی هاشم هەڵبژارد و لەبەرابەر خەڵکانی شام، سەرکەوتنی پێبەخشین و پاشایەتی بەئێوەدا. ڕێزی لەئیسلام گرت و ڕێبەرێکی دادپەروەری بۆ دیاریکردن و بۆ هەڵسووڕاندنی کاروبارەکان، فەرمانی پێدا. بۆ ئەوەی خواوەند بەئێوەی بەخشیوە، سپاسی بکەن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بن. خۆتان فریو مەدەن چوونکە کاروبارەکان لەدەستی ئێوەدایە. هەر بنەماڵەیەك شارێکیان هەیە و ئێوەیش شاری ئێمەن. بزانن دوای پێغەمبەر(د.خ) خەلیفەیەك نەڕۆشتە سەر تەختی وتاردان مەگەر عەل کوڕی ئەبی تالب و سەروەری باوەڕداران عەبدوالله کوڕی محەممەد (بەدەست باوکی عەباسی خوێنڕێژی

نیشاندا) دڵنیا بن خواوەند جڵەوی کاروبارەکان دەستی ئێمە دەرناهێنێت و شۆڕشەکەمان بەزیندووی دەهێڵێتەوە تا ئەو کاتەی کاروبارەکان بەعیسا کوڕی مریەم دەسپێرین. سوپاسی خوا دەکەین بۆ ئەو بەهرە وگەنجەی بەئێمەی بەخشی.

باوکی عەباس هاتە خوار و داوود کوڕی عەلی لەپێش ئەوەوە، رێگەی دەبڕی تا ڕۆشتە ناو کۆشکی فەرمانداری. براکەی یانی باوکی جەعفەری تاك دیناری لەمزگەوت مایەوە و بەیعەتی لەخەڵکان وەرگرت. باوکی جەعفەر بەهەمان شێوە بەیعەتی وەردەگرت تا ئەوەی نوێژی ئێوارێی لەگەڵ ئەوان خوێند و دواتر نوێژی شێوانیان خوێند و شەو داهات وبۆ ناو کۆشك گەڕایەوە.

دەڵێن: کاتێك داوود کوڕی عەلی وتارەکەی خوێندەوە، لەکۆتایی قسەکانیدا وتی: ئەی خەڵکینە، لەنێوان ئێوە و پێغەمبەر(د.خ)، هیچ خەلیفەیەك بوونی نەبووە جگە لەعەلی کوڕی ئەبی تالب و سەروەری باوەڕداران کەلەپشتە سەری منەوەیە.

دواتر هەردووکیان دابەزین و باوکی عەباس ڕۆشت و لەحەمام ئەعیەن لای سوپاکەی باوکی سەلە ئوردوی لێدا و هاوڕێ لەگەڵ ئەو ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی و پەردەیەکی لەنێوان خۆیاندا هەڵواسی و عەبدوالله کوڕی بەسامی وەك دەرگاوانی خۆی دەستنیشان کرد. داوود کوڕی عەلی وەك بۆ فەمرانڕەوایەتی کردنی کوفە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری، راسپارد و ئەم کەسانەی بۆ ئەم شوێنانە نارد: عەبدوالله کوڕی عەلی مامی بۆ هێرش کردنە سەر باوکی عەون لەشارەزوور، عیسا کوڕی موسای برازای بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی حەسەن کوڕی قەحتەبە کە لەم کاتەدا کوڕی هوبەیرەی لەواست گەمارۆدا بوو، یەحیا کوڕی جەعفەر کوڕی تەمام کوڕی عەباسی بۆ لای حەمید کوڕی قەحتەبە بۆ مەداین، باوکی یەقزان عوسمان کوڕی عوروە کوڕی محەممەد کوڕی عەمار کوڕی یاسری بۆ لای بەسام کوڕی ئیبراهیم کوڕی بەسام بۆ ئەهواز و سەلە کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمانی بۆ هێرش کردنە سەر مالك کوڕی تەواف ڕەوانە کرد.

باوکی عەباسی خوێنرێژ چەند مانگێك لەناو لەشکرگەکەی مایەوە و دواتر کۆچی کرد و ڕۆشتە شاری هاشمییە و لەناو کۆشکی فەرماندار، دابەزی. پێشتر دڵی لەباوکی سەلە کرمۆڵ بەشێوەیەك دوژمنایەتی و بێزاری خۆی لەو دەربڕی.

دەستەیەك دەڵێن: داوود کوڕی عەلی و کوڕەکەی موسا لەکاتی بەرێکەوتنی بەنی

عەباس بۆ عێراق، لەشام نەبوون بەڵكو لەعێراق یا سەرزەمینێكی دیكە، ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەم دووانە بەرێكەوتن و مەبەستی شامیان كرد. باوكی عەباس و كەسەكانی كەدەیانویست بەرەو كوفە برۆن، چاویان پێیان كەوت. ئەوان لەدومە ئەلجەندەل بەیەك گەیشتن. داوود چۆنیەتی كارەكانی لێ پرسی و باوكی عەباس لەڕووداو و پێشهاتەكان ئاگاداری كردەوە و پێی وت كەمەبەستی ڕۆشتن بۆ كوفەیان لەسەردایە تا لەوێ خۆیان و كارەكەیان ئاشكرا بكەن. داوود پێی وت: ئەی باوكی عەباس، دەڕۆیتە كوفە و شێری ئومەوییەكان مەروان كوڕی محەممەد لەحەڕانە و لەگەڵ خەڵكانی شام و جەزیرە، عێراقی لەژێر دەستایە و پیری عەرەب، یەزید كوڕی هوبەیرە بەسوپایەكی گەورە، لەعێراق، ژیان بەسەر دەبات! هەروەها وتی: ئەی مامی من، هەركەس باوەش بۆ ژیان بكاتەوە، ریسوا دەبێت. دواتر ئەم هۆنراوەی ئەعشی خوێندەوە:

فما میتة ان متها غیر عاجز          بعار اذا ما غالت النفس غولها

یانی: ئەگەر ریسوا و لاواز نەمرم، هەركاتێك مەرگ، دەست بەسەر گیانمدا بگرێت، دەبێتە هۆكاری ئەنگ و ئابروو چوونم.

داوود ڕووی كردە موسای كوڕی و وتی: سوێند بەخوا، كوڕی مامەكەت، ڕاستی وت: پێكەوە دەگەڕێینەوە تا ڕێزدارانە بژین یا پیاوانە بمرین. هەموویان گەڕانەوە.

كاتێك باسی ڕۆشتنیان لەحومەیمەوە بۆ كوفە، هاتە ئاراوە، عیسا كوڕی موسا دەیوت: تەنیا چواردەكەس لەماڵی خۆیان و لەناو بنەماڵەكانی خۆیان هاتنەدەر و بەدوای ئەوەدا گەڕان كەئێمە دەگەڕێین لەبەر ئەوەی گیانیان گەورە و دڵیان بەهێز بوو.

## شكستی مەروان لەزاب

باسمان كرد قەحتەبە، باوكی عەون عەبد مەلیك كوڕی یەزیدی ئەزدی بۆ شارەزوور ڕەوانە كرد و عوسمان كوڕی سوفیانی كوشت و لەپانتاییەكانی موسڵ مایەوە و مەروان كوڕی محەممەد لەحەڕانەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بەرێكەوت تا گەیشتە زاب و سەنگەری هەڵكەند. سەد وبیست هەزار شەڕكەر، هاوڕێیەتیان دەكرد. باوكی عەون بەرەو زاب پێشڕەوی كرد. باوكی سەلەمە، عۆیەینە كوڕی موسا و مێنهال كوڕی فەتانی و ئیسحاق كوڕی تەڵحەی (هەركام لەگەڵ سێ هەزار شەڕكەر) بۆ هاوكاری باوكی عەون، ڕەوانەی

کردن.

کاتێك باوکی عەباس دەرکەوت، سەلە کوڕی محەممەدی لەگەڵ دوو هەزار کەس، عەبدوڵڵەی تایی لەگەڵ هەزار وپێنسەد کەس و عەبد حەمید کوڕی ڕێبعیی تایی لەگەڵ دوو هەزار کەس و داس کوڕی نەزەلەی لەگەڵ پێنسەد پیاوی شەڕکەر بۆ هاوکاری باوکی عەون ڕەوانە کرد. دواتر وتی: لەناو کەسەکانی خۆم، کێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی مەروان دەڕوات؟ عەبدوڵڵە کوڕی عەلی وتی: من. ئەوی بۆ لای باوکی عەون نارد. عەبدوڵڵە، ڕۆشتە لای باوکی عەون. باوکی عەون لەخێوەتەکەی خۆی هاتەدەر و هەموو کاروبارەکانی بەو سپارد.

کاتێك دوو ڕۆژ لەجەمادی الثانی ساڵی ١٣٢/ ١٦ ژانویەی ٧٥٠ زایینی تێپەڕی، عەبدوڵڵە کوڕی عەلی بەدوایی کۆتاییەکانی ئاوەکەدا گەڕا کەلەزاب، نیشانیاندا. فەرمانی بەعۆیەیینە کوڕی موسادا کەلەگەڵ پێنج هەزار شەڕکەر پەڕییەوە و خۆی گەیاندە لەشکرگەکەی مەروان و شەڕی لەگەڵ مەروانییەکان دەستپێکرد تا شەو داهات و بۆ لای عەبدوڵڵە کوڕی عەلی گەڕایەوە.

مەروان شەوی گەیاندە ڕۆژ، پردی هەڵبەست و پەڕییەوە. وەزیرەکانی ئامۆژگاریان کرد و ڕێگەی ئەم کارەیان لێکرد بەلام ڕازی نەبوو و کوڕەکەی عەبدوڵڵەی ڕەوانە کرد تا لەشوێنێك لەخوارەوەی سوپاکەی عەبدوڵڵە کوڕی عەلی دابەزێ. عەبدوڵڵە کوڕی عەلی، موخاریقی لەگەڵ چوار هەزار کەس بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی عەبدوڵڵە کوڕی مەروان ڕەوانە کرد. کوڕی مەروان، وەلید کوڕی معاویە کوڕی مەروان کوڕی حەکەم بۆ شەڕی ئەو نارد کەرووبەرووی یەکبوونەوە و هاوەڵانی موخاریق هەڵاتن بەلام خۆی خۆڕاگری کرد و ئەسیر کرا و دەستەیەکی دیکەیش کە لەگەڵ ئەودا ئەسیر کران، کوژران و سەریان بڕین و سەری ئەوانیان لەگەڵ موخاریق، بۆ لای مەروان ڕەوانە کرد. مەروان وتی: یەکێك لەئەسیرەکان بێننە لای من. موخارقیقیان بردە لای. پیاوێکی لاغر بوو. مەروان وتی: تۆ موخاریقی؟ وتی: کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی سوپام. وتی: موخاریق دەناسی؟ وتی: بەڵێ. وتی: سەیری ئەم سەرە بڕاوانە بکە بزانە کامیان موخاریقە. سەیری سەرێکی کرد و وتی: ئەمەیە. مەروان ئەوی ئازاد کرد. پیاوێك لەهاوەڵانی مەروان سەیری موخاریقی کرد و بێ ئەوەی بیناسێت، وتی: خوا ئەبوموسلیم نفرین بکات کەئەمانەی بۆ شەڕی

ئێمە ناردوە.

دەستەیەك دەڵێن: كاتێك موخاریق سەیری سەرەكانی دەكرد، وتی: سەری لەناو سەرەكاندا نابینم، گومان دەكەم هەڵاتوە. مەروان ئەوی ئازاد كرد.

كاتێك هەواڵی شەڕ و شكستی هاوەڵانی بەعەبدوالله كوڕی عەلی گەیشت، كەسانێكی بۆ سەر ڕێگەی هەڵاتوان نارد و ڕێگەی نەدان بۆ ناو لەشكرگەكە، بگەڕێنەوە تا خەڵكان لەم شكستە ئاگادار نەبنەوە و بەشوومی نەزانن. باوكی عەون پێشنیاری پێكرد پێش ئاشكرا بوونی چارەنووسی موخاریق، شەڕ لەگەڵ مەروان دەستپێبكات بۆ ئەوەی خەڵك و شەڕكەران، لەم هەواڵە وەرەیان نەڕوخێت. لەناو شەڕكەران جاڕیاندا تا خۆیان بۆ شەر ئامادە و تەیار بكەن. محەممەد كوڕی سەولی وەك جێگری خۆی لەسەر سوپاكە، دەستنیشان كرد و هێرشی كردە سەر سوپاكەی مەروان. فەرماندەیی باڵی ڕاستی بەباوكی عەون و باڵی چەپی بەوەلید كوڕی معاویە سپارد. ژمارەی سوپاكەی، بیست هەزار شەڕكەر بوو. ئاماژەیان بەژمارەی دیكەیش داوە. وتوویانە: ژمارەی سوپاكەی لەدوانزە هەزار شەڕكەر پێكهاتبوو.

كاتێك دوو سوپا شەڕیان دەستپێكرد، مەروان بەعەبدعەزیز كوڕی عومەر كوڕی عەبدولعەزیزی وتی: ئەگەر ئەمڕۆ هەتاو ئاوا ببێت و شەڕ لەگەڵ ئێمە نەكەن، ئێمە ئەو كەسانەین كەفەرسانڕەوایی بەمەسیح دەسپێرین، ئەگەر پێش ئاوا بوونی خۆر، شەڕ دەسپێبكەن، هەمووان لەلایەن خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/ ٢/ ١٥٦).

مەروان كەسی بۆ لای عەبدوالله نارد و خوازیاری ئاگر بڕ بوو. عەبدوالله وتی: زادەی روزەیق، درۆی كرد. هەتاو ئاوا نابێت بەخواستی خوا هێرش دەكەمە سەری. مەروان بەخەڵكانی شامی وت: چاوەڕوان بن چوونكە ئێمە شەڕ دەستپێناكەین. ئەو بەردەوام سەیری هەتاوی دەكرد. وەلید كوڕی معاویە كوڕی مەروان كوڕی حەكەم (خەزووری مەروان) هێرشی برد. مەروان كوڕی محەممەد تووڕە بوو و جوێنی پێدا. معاویە لەگەڵ باوكی عەون شەڕی كرد. باوكی عەون بۆ لای عەبدوالله كوڕی عەلی گەڕایەوە. ئەو بەموسا كوڕی كەعبی وت: ئەی بەندەی خوا! فەرمان بەشەڕكەران بدە دابەزن. دەنگ بەرز بوویەوە كەپەیوەستی زەوی ببن. شەڕكەران دابەزین و ڕمەكانیان

بەرز کردەوە و کەوتنە سەرچۆك و شەڕیان دەستپێکرد. خەڵکانی شام چاوەڕێیان دەکرد وەك بڵێی پاشەکشێیان کردووە. عەبدواللە کوڕی عەلی پێشڕەوی کرد و بەردەوام دەیوت: پەروەردگارا، تاکەی لەڕێگای تۆدا بکوژرێین؟ هاواری کرد: ئەی خوراسانییان، ئەی ئەو کەسانەی تۆڵەی ئیبراهیم دەکەنەوە، ئەی محەممەد، ئەی مەنسور! شەڕ رووی لەدژواری کرد. مەروان بەخەڵکانی قوزاعەی وت: دابەزن. وتیان: فەرمانی دابەزین بەبەنی سەلیم بدە. کەسی بۆ لای سەکاسەك نارد و فەرمانی هێرش بردنی پێدان. وتیان: فەرمان بەبەنی عامر بدە. پەیامی بۆ خەڵکی سەکون نارد تا هێرش ببەن. وتیان: فەرمانی هێرش بەغەتەفانییەکان بدە. بەفەرماندەی پاسەوانەکانی وت: دابەزە. وتی: سوێند بەخوا، خۆم ناکەمە نیشانە. وتی: سوێند بەخوا ئازارت دەدەم! وتی: خۆزگە تواناى ئەو کارەت دەبوو.

مەروان لەو رۆژەدا هەر کارێکی دەکرد، پێچەوانەکەی روویدەدا. فەرمانیدا و سامانەکانیان هێنایەدەر. بەخەڵکی وت: خۆڕاگر بن و شەڕ بکەن چوونکە ئەم سامانە بۆ ئێوەیە. خەڵك کەم کەم، لەسامانەکەیان دەدزی. پێیان وت: خەڵك روویان لەسامانەکە کردووە و دەترسین، بیدزن. کەسی بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی نارد و پەیامیدا: بۆ دواوەی سوپاکە برۆ و هەرکەسێك مەبەستی دزینی سامانەکەی کرد، بیکوژە و رێگەی ئەم کارە لەشەڕکەران بگرە.

عەبدواللە ئالأی هەڵگرت و لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی بەرێکەوت. خەڵك وتیان: رابکەن، رابکەن، مەروان شکستی خوارد و پردەکەیان رووخاند. ئەو کەسانەی لەئاودا خنکان ژمارەیان فراوانتر بوو لەو کەسانەی لەگۆڕەپانی شەڕدا کوژران.

لەو ناو ئەو کەسانەی لەئاوەکەدا خنکان، ئیبراهیم کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك (پیاوی دوور خراوە لەخەلافەت) بینرا. ئەویان لەناو خنکاوەکاندا دۆزییەوە. محەممەد وتی: کاتێك رێگەی دەریامان بۆ ئێوە کردەوە و رزگارمان کردن، بنەماڵەی فیرعەونمان لەئاوەکەدا خنکان و ئێوە بینەری خنکان و لەناوچوونی ئەوان بوون (بقره/٢/٥٠) دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو عەبدواللە، لەشام ئەوی کوشت.

لەم شەڕەدا سەعید کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کوژرا. دەستەیەك دەڵێن: بەدەستی عەبدواللە و لەشام کوژرا.

عەبدوالله کوڕی عەلی بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەناو لەشکرگەکەی مایەوە. پیاوێك لەمناڵەکانی سەعید کوڕی عاس بۆ سەرکۆنە کردنی مەروان وتی:

لج الفرار بمروان فقلت له: عاد الظلوم ظليما همه الهرب

اين الفرار و ترك الملك اذ ذهبت عنك الهوينا فلادين و لا نسب

فراشة الحلم فرعون العقاب و ان تطلب نداه فكلب دونه و كلب

یانی: هەڵاتن بەسەر مەرواندا زاڵبوو و بۆ پاشەکشێ کردنی بەردەوام ناچاری دەکرد. پیم وت: ستەمکار، ستەمی لێکرا و تەنیا هونەری، هەڵاتن بوو. پاشایەتی بەکێ دەسپێریت بۆ کوێ دەڕۆیت؟ ئارامییان لەتۆ سەندەوە، نە ئایینت هەیە نەنەژاد. پەروانەیەکی خۆڕاگر هاوشێوەی فیرعەونی سزا دەرکەوتووە و ئەگەر بەدوایی بەخششی ئەودا بگەڕێیت، سەگێك دەبینی کەسەگێکی دیکە لەبەردەمیایەتی.

ئەو ڕۆژە عەبدوالله کوڕی عەلی نامەی بۆ باوکی عەباس نووسی و لەسەرکەوتنەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە. لەشکرگەکەی مەروانی تالآن کرد و ژمارەیەکی زۆری کەل و پەل و کەرەستەی شەڕی کۆکردەوە.

کاتێك نامەکە بەدەستی باوکی عەباس گەیشت، دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند و بەهەرکام لەشەڕکەران، پێنسەد دیناری بەخشی.

شکستی مەروان لەزاب ڕۆژی یەکشەممە یانزە ڕۆژیی یەکەم لەجەمادی الثانی/ ٢٥ ژانویەی ٧٥٠ زایینی بوو. یەکێك لەو کەسانەی لەو ڕۆژەدا کوژرا، یەحیا کوڕی معاویە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك برای پاشای ئاندۆلۆس بوو. کاتێك رووی کردە گۆڕەپانی شەڕ، عەبدوالله کوڕی عەلی گەنجێکی بەشکۆی بینی کەبەجیا شەڕی دەکرد. بانگی کرد: ئەی گەنج، ئەمانت هەیە ئەگەر تەنانەت مەروان کوڕی محەممەد بیت! وتی: ئەگەر ئەو نەبم، کەمتر لەو نیم. وتی: ئەمانت پێدەبەخشم، هەرکەسێك بیت! سەری داخست و دواتر سەری بەرز کردەوە و وتی:

اذل الحياة و كره الممات .و كلا اراه طعاما و بيلا

فان لم يكن غير احداهما فسير الى الموت سيرا جميلا

یانی: ئایا بەریسوا زانینی ژیانە یا بێزاری لەمەرگ. ئەگەر جگە لەم دووانە هیچ شتێکی دیکە نەیێت، دەبێت سەربڵند و سەرفەراز، بەرەو مەرگ، بڕۆین.

شەڕی کرد تا کوژرا. دواتر زانیان کەمەسلەمە کوڕی عەبدمەلیکە.

## کوژرانی ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ( ڕێبەر )

پێشتر ئاماژەمان بەچۆنیەتی زیندانی کرانی ئەودا. سەبارەت بەمەرگی ئیبراهیم، گێڕانەوەکان جۆراوجۆرن. دەستەیەك دەڵێن: مەروان لەحەڕان زیندانی کرد و حەسەن کوڕی سەعید کوڕی هوشام و دوو کوڕەکەی عوسمان و مەروانیشی زیندانی کرد. هەروەها ئەم کەسانەیش: عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز، عەباس کوڕی وەلید کوڕی عەبدولمەلیك و باوکی محەممەدی سوفیانی. لەو نەخۆشییە گشتگیرەکەی لەحەڕان بلاو بوویەوە، عەباس کوڕی وەلید و ئیبراهیم کوڕی محەممەد، مردن. عەبدوالله کوڕی عومەریش مرد.

هەینییەك دوای شکستی مەروان لەزاب، سەعید کوڕی هوشام و کوڕەکە مامەکەی و زیندانییەکانی دیکە، زیندانوانەکەیان کوشت و هاتنەدەر. خەڵکی حەڕان، ئەوانیان کوشت. ئەوکەسانەی بەدەستی خەڵکی حەڕان کوژران، ئەمانە بوون: شەراحیل کوڕی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك، عەبدولمەلیك کوڕی بیشری تەغلەبی، بەتریقی چوارەمی ئەرمەنستان بەناوی کوشان، باوکی محەممەد سوفیانی لەزیندان مایەوە و لەگەڵ کەسانی دیکە کەهاتنە دەرەوەیان بەڕەوا نەدەزانی، ڕۆژگاری بەسەر بەرد. مەروان هەڵاتوو لەشەڕی زاب گەڕایەوە وئەوانی ئازاد کرد.

دەستەیەك دەڵێن: مەروان ماڵەکەی بەسەر ئیبراهیمی ڕێبەردا وێران کرد و ئەوی کوشت.

دەستەیەك دەڵێن: شەراحیل کوڕی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ ئیبراهیم، زیندان کرابوو. ئەم دووانە هاتوچۆی یەکیان دەکرد و هاوڕێیەتی لەنێوانیاندا دروست بوو. ڕۆژێك نێردراوێك لەلایەن شەراحیلەوە گەیشتە لای ئیبراهیم و شیری هێنا و وتی: براکەت دەڵێت: لەم شیرەم خواردەوە و تامەکەی خۆش بوو، ویستم تۆیش لێی بخۆیتەوە. ئیبراهیم شیرەکەی خوارد و جەستەی بەرەو لاوازی ڕۆشت. ئەو ڕۆژە بڕیاربوو سەردانی شەراحیل بکات بەلأم نەیتوانی و نەڕۆشت. شەراحیل پەیامی بۆ نارد: درەنگت کرد، چی ڕوویداوە؟ ئیبراهیم وەلأمی بۆنارد: ئەو شیرەی بۆت ناردم بووە هۆی ئازاری سکم.

شەراحیل وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لەخوا نییە، ئەمڕۆ نەشیرم خواردۆتەوە و نەشیرم بۆ تۆ ناردوە. هەمووان لەلایەن خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقره/٢/١٥٦) سوێند بەخوا فێڵیان لێکردیت. ئیبراهیم شەوی نەکردە ڕۆژ و مرد. ئیبراهیم کوڕی هەرسیمە لەپرسەی ئەودا وتی:

قد كنت احسبنی جلدا فضعضعنی      قبر بحران فيه عصمة الدين

فيه الامام و خير الناس كلهم      بين الصفائح و الاحجار و الطين

فيه الامام الذی عمت مصائبه      و عيلت كل ذی مال و مسكين

فلا عفی الله عن مروان مظلمة      لكن عفی الله عمن قال آمين

یانی: خۆم بەپیاوێکی بەهادار و بەهێز گومان دەکرد بەڵام بەخاك سپاردنی پیاوێك لەحەران، منی لەرزاند. لەم ئارامگایەدا، کۆڵەکەی دین نووستوە. لەم ئارامگایەدا ئیبراهیمی ڕێبەر و باشترینی خەڵکانی هەموو جیهان لەناو تاشەبەردەکان، خشتەکان، گڵ و خاك و خوێن، خەوتووە. لێرەدا ڕێبەرێکە کەمەرگی ئەو، هەموانی پرسەگێر کرد و هەر نەدار و سامانێکی بێ بەرگ و نەوا کرد. خوا لەمەروان خۆش نەبێت. خوا لەو کەسە خۆش بێت کەدەڵێت: خراپتر بێت، خراپتر بێت!

ئیبراهیم لەماوەی ژیانی پیاوێکی چاکەکار ورێزدار بوو. جارێك ڕۆشتە مەدینە و سامانێکی زۆری لەناو خەڵکەکەی دابەش کرد. بۆ عەبدوالله کوڕی حەسەن پێنسەد دیناری نارد، بۆ جەعفەر کوڕی محەممەد هەزار دینار و بۆ عەلەوییەکانی دیکە، سامانێکی فراوان. حسەین کوڕی یەزید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب ڕۆشتە لای. ئەوی لەسەر کۆشی خۆی دانیشاند و پرسی: تۆ کێیت؟ وتی: حسەین کوڕی عەلی کوڕی زەید کوڕی عەلی. ئیبراهیم دەستی بەگریان کرد بەشێوەیەك عاباکەی تەڕ بوو. دواتر کارگوزارەکەی خۆی بانگ کرد و فەرمانی پێدا هەموو سامانەکەی بێنێت. چوارسەد دیناری هێنا و ئیبراهیم، هەمووی بەو بەخشی، وتی: ئەگەر هیچی دیکەم لەدەستا دەبوو، بەتۆم دەبەخشی. یەکێك لەکۆیلەکانی بۆ لای دایکی ئەو، ڕیتە کچی عەبدولەلیك کوڕی محەممەد کوڕی حەنیفە نارد و داوای لێبووردنی کرد.

لەدایك بوونی ئەو لەساڵی ٨٢/٧١٠ زایینی بوو. دایکی خاتوونێکی بەڕێز بەناوی سەلما بوو.

شیاو بوو داستانی کوژرانی ئەو پێش شکستی مەروان باس بکرێت، لەبەر ئەوە سەرەتا ئەومان باس کرد و دواتر ئەمە، تا پەیوەست بوونی ڕووداوەکان لەشوێنی خۆیدا بمێنێتەوە.

## کوژرانی مەروان کوڕی محەممەد کوڕی مەروان کوڕی حەکەم

لەم ساڵەدا، سێ ڕۆژ بۆ کۆتایی زی حەججەی ١٣٢/ ٦ ئوتی ٧٥٠ زایینی مەروان کوڕی محەممەد لەبووسیر یەکێك لەشارەکانی میسر، کوژرا.

داستانەکەی بەمشێوەیە بوو: کاتێك عەبدوالله کوڕی عەلی شکستی پێهێنا و لەگۆڕەپانی زاب، بەهەڵاتن ناچاری کرد، ڕۆشتە موسڵ کەفەرماندارەکەی هوشام کوڕی عەمرۆ تەغلەبی هاوڕێ لەگەڵ بیشر کوڕی خەزیمەی ئەسەدی بوو. ئەم دووانە، پردەکەیان پچڕاند. خەڵکانی شام هاواریان کرد: ئەمە سەروەری باوەڕدارانە. وتیان: درۆ دەکەن، سەروەری باوەڕداران، هیچ کات ڕاناکات. خەڵکانی موسڵ، جوێنبارانیان کرد و بەجەعدی ناویان برد. وتیان: ئەی جەعدی، سپاس بۆ خوا پاشایەتی ئێوەی لەڕەگ و ریشەوە دەرهێنا و فەرمانڕاویەتی لێسەندنەوە. سپاس بۆ خوا، کەچاوی ئێمەی بەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)ڕووناك کردەوە. کاتێك ئەمەی بیست، بەرەو بەلەد بەرێکەوت و دیجلەی بڕی و ڕێگەی حەڕانی گرتەبەر. برازاکەی، ئەبان کوڕی یەزید کوڕی محەممەد کوڕی مەروان کارگوزاری خۆی لەشاری حەران بوو. بیست و چەند ڕۆژ لەوێ مایەوە.

عەبدوالله کوڕی عەلی بەرێکەوت تا ڕۆشتە ناو شاری موسڵ. هوشامی لەسەر کار لابرد و محەممەد کوڕی سولی لەجێگەی ئەودانا. دواتر شوێن مەروان کەوت. کاتێك عەبدوالله لێی نزیك کەوتەوە، مەروان کەسانی بنەماڵەکەی هەڵگرت و هەڵات و برازاکەی ئەبان کوڕی یەزیدی، زاوای مەروان (هاوسەری دایکی عوسمان، کچی مەروان) وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

عەبدوالله کوڕی عەلی گەیشتە حەڕان. ئەبان ئاڵا و جل و بەرگی ڕەشی بەرز کردەوە وپێشوازی لێکرد. بەیعەتی لەگەڵ کرد و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی دەربڕی. عەبدوالله ئەمانی پێبەخشی هەروەها بەخەڵکانی حەڕان و جەزیرەیش، ئەمانی بەخشی.

مەروان بەرەو حمس بەرێکەوت و خەڵکەکەی، گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆیان نیشاندا. دوو یا سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر، ئەو شارەیشی بەجێهێشت. کاتێك کەمی شەڕکەرانی

ئەویان بینی، چاوی تەماحیان تێبڕی و وتیان: ترساوە و هەڵاتو. دوای ئەوەی لەشارەکەی ئەوان ڕۆشتەدەر، شوێنی کەوتن و لەچەند میلی، گرتیان. کاتێك تەپ و تۆزی سوارەکانی بینی، لەسەر ڕێگەی ئەوان دانیشت. کاتێك لەبۆسەکە تێپەڕین، هاتەدەر و لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری کرد و سوێندیدان. ئەوان تەنیا بەشەڕ کردن ڕازی بوون. شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و ئەوانەی لەبۆسەکەدا دانیشتبوون، لەپشتەوە هێرشیان برد. خەڵکانی حمس شکستیان خوارد و کوشتار کران و هەڵاتن تا گەیشتنە نزیك شارەکەی خۆیان.

مەروان ڕۆشتە دیمەشق کەفەرمانداریەکەی وەلید کوڕی معاویە کوڕی مەروان بوو. فەرمانی پێدا: شەڕیان لەگەڵ بکە تا خەڵکانی شام بگەمن. مەروان ڕووی لەفەلەستین کرد و لەسەر کەنارەکانی ڕووبارەی باوکی فوتروس دابەزی. حەکەم کوڕی زەبعانی جوزامی دەستی بەسەر فەلەستیندا گرتبوو. مەروان کەسی بۆ لای عەبدوڵلە کوڕی ڕوەح کوڕی زێنباعی جوزامی نارد و داوای کرد پەنای بدات و عەبدوڵلە، پەنای پێدا. گەنجخانەکە لەدەستی حەکەم کوڕی زەبعاندا بوو.

سەفاح نامەی بۆ عەبدوڵلە کوڕی عەلی نوسی و فەرمانی پێدا شوێنپێی مەروان هەڵبگرێت. بەرێکەوت تا گەیشتە موسڵ. خەڵکەکەی ڕەشیان پۆشی و هاتنەدەر و پێشوازییان لێکرد و دەروازەکانی شارەکەیان بۆ کردەوە. دواتر بەرەو حەران بەرێکەوت کەئەبان کوڕی یەزید، ڕەشی پۆشی و هاتەدەر و پێشوازی لێکرد. ئەمانی پێبەخشی. عەبدوڵلە ئەو ماڵەی وێران کرد کەزیندانی ئیبراهیم بوو. دواتر لەحەڕانەوە بەرەو مێنبەج بەرێکەوت کەخەڵکەکەی ڕەنگی ڕەشیان هەڵبژاردبوو. لەوێ مایەوە و نێردراوەکانی بۆ لای خەڵکانی قێنسرین نارد و بەیعەتی لێوەرگرتن. براکەی عەبد سەمەد فەرمانداری ئەو شارە بوو. سەفاح لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بۆ هاوکاری کردنی عەبدوڵلە، ڕەوانەی کردبوو. دوو ڕۆژ دوای گەیشتنی عەبد سەمەد بەقێنسرین بەرێکەوت. خەڵکەکەی ئاڵای ڕەشیان بەرز کردبوویەوە. بەرەو حمس بەرێکەوت و بەیعەتی لەخەڵکەکەی وەرگرت و چەند ڕۆژێك لەو شارە مایەوە و دواتر بەرەو بەعلبەك، ئەسپی غاردا و دوو ڕۆژیش لەو شارە مایەوە و بەرێکەوت و لەمێزە (یەکێك لەگوندەکانی غوتە) دابەزی. ساڵحی برای بۆ هاوکاری کردنی ئەو گەیشت. لەگەڵ هەشت هەزار شەڕکەر لەمەرجی عوزرا دابەزی. عەبدوڵلە پێشڕەوی کرد و لەدەروازەی ڕۆژهەڵات دابەزی. ساڵح لەدەروازەی جابییە، باوکی عەون لەدەروازی کەیسان، بەسام کوڕی ئیبراهیم لەدەروازەی خورد، حەمید کوڕی قەحتەبە لەدەروازەی توما

و عەبد سەمەد و یەحیا کوڕی سەفوان و عەبباس کوڕی یەزید لەدەروازەی فەرادیس. وەلید کوڕی معاویە، فەرمانڕەوای دیمەشق بوو. گەمارۆیان خستەسەر و ڕۆژی چوارشەممە پێنجی ڕەمەزانی ١٣٢/ ١٧ ئاوریلی ٧٥٠ زایینی، ڕۆشتنە ناو شارەکە.

یەکەم کەس کە لەدەروازەی ڕۆژهەڵات بەدیواری شارەکەدا هەڵگەڕا، عەبدوڵڵەی تایی بوو. لەشوێنی دەروازەی خورد، بەسام کوڕی ئیبراهیم سەرکەوت. سێ کاژێر شەڕیان کرد و وەلید کوڕی معاویە و هاوەڵانی، کوژران.

عەبدوالله کوڕی عەلی پانزە ڕۆژ لەدیمەشق مایەوە و دواتر بەرەو فەلەستین بەڕێکەوت. خەڵکی ئەردەن، بەئالأی ڕەش پێشوازییان لێکرد. ئەو ڕۆشتە ڕوباری فوتورس و بینی مەروان، ئەو شوێنەی بەجێهێشتوە. عەبدوالله لەفەلەستین مایەوە و یەحیا کوڕی جەعفەری هاشمی لەشارەکە دابەزی. نامەی سوفاحی پێگەیشت کەفەرمانی دەدا ساڵح کوڕی عەلی بەدوای مەرواندا ڕەوانە بکات. ساڵح لەزیقەعدەی ١٣٢/ ژوئەنی ٧٥٠ زایینی لەڕوباری فوتورس پەڕییەوە و کوڕی فەتان و عامر کوڕی ئیسماعیل، هاوڕێیەتیان دەکرد. ساڵح، باوکی عەونی لەگەڵ عامر کوڕی ئیسماعیلی حارسی ڕەوانە کرد. ئەوان بەڕێکەوت تا گەیشتنە عورەیش. مەروان لەسەر ڕێگەی، لەهەر شوێنێك گژ و گیا و داری بینی، ئاگری تێبەردا.

ساڵح بەڕێکەوت و لەکەنارەکانی ڕووباری نیل دابەزی و دواتر ڕۆشت تا گەیشتە سۆعەید. بیستی سوارەکانی مەروان گژوگیاکان دەسوتێنن. کەسانێکی ڕەوانە کرد وئەوانیان گرت و لەفوستات، بۆ لای ساڵحیان برد. بەڕێکەوت و لەشوێنێك بەناوی زات سەلاسیل، دابەزی، باوکی عەون، عامر کوڕی ئیسماعیلی حارسی لەگەڵ شوعبە کوڕی کەسیر مازنی لەگەڵ سوارکارانی موسڵ، ڕەوانە کرد و ڕووبەڕووی سوارەکانی مەروان بوونەوە. سوارەکانی مەروان لەشوێنی مەروان ئاگاداریان کردەوە بەو مەرجەی ئەمانیان پێببەخشێت. سەرەتا لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و دەستەیەك لەوانی کوشت و دەستەیەکی ئەسیر. دوای ئەوە بوو پرسیاری شوێنی مەروانیان کرد. بەڕێکەوتن و بینییان لەکەنیسەی بووسیر دانیشتووە. لەشەودا گەیشتنە سەری. سوارەکانی باوکی عەون ژمارەیان کەم بوو. عامر کوڕی ئیسماعیل وتی: ئەگەر دنیا ڕووناك ببێتەوە و ژمارەی کەمی ئێمە ببینن، لەناومان دەبەن و کەس لەئێمە ڕزگاری نابێت. کاڵانی شمشێرەکەی شکاند و هاوەڵانیشی، ئەو کارەیان کرد. هێرشیان کردە سەر شەڕکەرانی مەروان کەشکستیان خوارد و هەڵاتن. پیاوێك هێرشی کردە سەر مەروان بێ ئەوەی بیناسێت و ئەوی خستە خوار. جارچییەك جاریدا: سەروەری باوەڕداران

کەوت! لەدەوری کۆبوونەوە و پیاوێکی هەنار فرۆش لەخەڵکانی کوفە رایکرد و سەری بڕی. عامر هەڵیگرت و سەری براوەکەی بۆ باوکی عەون نارد و ئەویش بۆ ساڵح.

کاتێك سەرە براوەکەی بەدەست گەیشت، فەرمانیدا، زمانی ببڕن و فڕێبدەنە سەرزەوی. پشیلەیەك زمانی فڕاند و ساڵح وتی: رۆژگارچەندە وچەند ئامۆژگاریمان پێدەبەخشێت! ئەمە زمانی مەروانە پشیلەیەك بردی! شاعیرێك وتی:

قد فتح اللة مصر عنوة لكم　　　و اهلك الفاجر الجعدى اذ ظلما

فلاك بقولة هر يجر ره　　　و كان ربك من ذى الكفر منتقما

یانی: خواوەند میسری بەزۆری شمشێر بۆ ئێوە ئاوەلا کرد و خراپەکاری جەعدی لەناو بردە کەستەمکاری کردە پیشە. پشیلەیەك زمانی قسەکەری ڕفاند و خواردی. پەروەردگار تۆڵە لەستەمکاران دەستێنێتەوە.

کوژرانی ئەو دوو شەو بۆ کۆتایی زی حەجەجە/ ٧ ئوتی ٧٥٠ زایینی روویدا. ساڵح بۆ شام گەڕایەوە و باوکی عەونی وەك فەرمانڕەوای میسر دەستینشان و کۆیلە و سامان و کەرەستەکانی شەڕی بەو سپارد.

ساڵح سەری براوی مەروانی بۆ سەفاح، نارد.

کاتێك سەری مەروان بەدەستی سەفاح گەیشت، لەکوفە بوو. کاتێك بینی، سەری خستە سەرخاك و نوێژی خوێند. دواتر سەری بەرز کردەوە و وتی: سپاس بۆ خوا کەسەرکەوتنی بەمن بەخشی و خوێن و تۆڵەی من کە لەئەستۆی تۆ و هاوەڵانی تۆ کەدوژمنی دینن، بەفیڕۆ نەڕۆشت. ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

لو يشربوون درمى لم يرو شاربهم　　　و لا دماؤهم للغيظ يشقينى

یانی: ئەگەر خوێنی من بخۆنەوە، تێر نابن بەهەمان شێوە کەمن لەخوێنی ئەوان تێر نابم.

کاتێك مەروان کوژرا، دوو کوڕەکەی عەبدوالله کوڕی مەروان و عوبەیدالله کوڕی مەروان، بۆ سەرزەمینی حەبەشە کۆچیان کرد. حەبەشییەکان ئەوانیان ئازاردا و شەڕیان لەگەڵ کردن بەشێوەیەك عوبەیدالله کوژرا و عەبدوالله و چەند کەسێك بەزیندووی مانەوە و تا سەردەمی مەهدی ژیا و لەم کاتەدا فەرمانداری فەلەستین، محەممەد کوڕی ئەشعەس ئەوی گرت و بۆ لای مەهدی، ڕەوانەی کرد.

کاتێك مەروان کوژرا، عامر مەبەستی ئەو کەنیسەی کرد کەژنان و منداڵەکانی مەروان،

لەوێ بوون. کۆیلەیەکی بۆ ژنان دانابوو و فەرمانی پێدا بوو بیانکوژێت. عامر کۆیلەکە و ژن و کچەکانی مەروانی گرت و بۆ سالح کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عەباسی نارد. کاتێك ڕۆشتنە لای ئەو، کچە گەورەکەی مەروان زمانی کردەوە و وتی: ئەی مامی سەرورەی باوەڕداران، خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە. ئێمە کچەکانی تۆ و کچەکانی برا و کوڕی مامەکەی تۆین. بەو ئەندازەی ستەممان لەئێوە کرد، مێهرەبانیمان پێ ببەخشن.

وتی: سوێند بەخوا، هیچ کام لەئێوە بەزیندووی ناهێڵمەوە! ئایا باوکی تۆ، برازاکەی من ئیبراهیمی ڕێبەری نەکوشت؟ هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەینی نەکوشت و لەکوفە، هەڵینەواسی؟ وەلید کوڕی یەزید، یەحیا کوڕی زەیدی نەکوشت و لەخوراسان، لەداری نەدا؟ کوڕی زیادی زیادی رووسپی زادە، موسلیم کوڕی عەقیلی نەکوشت؟ یەزید کوڕی معاویە، حسەین کوڕی عەلی و منداڵ و کەسەکانی نەکوشت؟ ژنانی پێغەمبەری نەبردە لای خۆی و هاوشێوەی کۆیلە لەبەرابەری نەوەستان؟ سەری حسەینیان نەبردە لای و مێشکیان نەپرژاند؟ بۆ ڕێگە بدەم ئێوە زیندوو بن! کچ وتی: لەبەر ئەوەی تۆ مێهرەبانیت. وتی: ئەمەیان ئەگەری هەیە. ئەگەری دەخوازیت تۆ دەکەمە هاوسەری کوڕەکەم ئەبوو ئەلفەزڵ و مارەیی تۆ دەدەم! کچ وتی: چ ڕێزگرتنێك گەورەتر لەمە؟ ئێمە بۆ حەران بگەڕێنەرەوە. ئەوانی بۆ حەران نارد. کاتێك گەیشتنە حەڕان و بینیان ماڵەکانی مەروان وێران بووە، بەدەنگی بەرز، دەستیان بەگریان کرد.

دەڵێن: بووکەیر کوڕی ماهان ڕۆژێك لەگەڵ هاوەڵانی خۆی دانیشتبوو. ئەمە، پێش کوژرانی مەروان بوو. لەگەڵ هاوەڵانی خۆی قسەی دەکرد کەعامر کوڕی ئیسماعیل تێپەڕی وئەوی نەناسییەوە. ڕۆشتە سەر ئاوی دیجلە و ئاوی خوارد و گەڕایەوە. بووکەیر بانگی کرد و وتی: ئەی کوڕی گەنج، ناوت چییە؟ وتی: عامر کوڕی ئیسماعیل کوڕی حارس. وتی: دوور بێت کە لەبەنی موسلییە بیت. وتی: لەوانم. وتی: سوێند بەخوا، تۆ مەروان دەکوژیت. ئەمە وتارە بووە هۆی پشتگەرمی و دڵخۆشی ئەو و هیوای کوشتنی مەروانی لەسەردا پەروەردە دەکرد.

کاتێك مەروان کوژرا، ٦٢ یا ٦٩ ساڵ تەمەنی بوو. فەرمانڕەوایی ئەو لەو کاتەوەی بەیعەتیان لەگەڵ کرد تا کاتی کوشتنەکەی، ٥ ساڵ و ١٠ مانگ و ٦ ڕۆژ درێژەی کێشا. نازناوەکەی باوکی عەبدولمەلیك بوو. دایکی دایکی منداڵ و خاتوونێکی کورد بوو کەپێشتر هاوسەری ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر و ئەو ڕۆژەی ئیبراهیم کوژرا، محەممەد کوڕی مەروان، ئەم

خاتوونەی کردە هاوسەری خۆی و مەروان کوڕی محەممەد چاوی بەدنیا هەڵهێنا. لەبەر ئەمە بوو عەبدوللە کوڕی عەیاش کوڕی موشریف بەسەفاحی وت: سپاس بۆ خوا کەلەجیاتی (کەری جەزیرە) و کوڕی کەنیزی نەخەع، کوڕی مامی پێغەمبەر کوڕی عەبدولموتەلیبی کردە فەرمانڕەوای ئێمە.

مەروانیان بە(کەر) و (جەعدی) ناو دەبرد چوونکە ئەو باوەڕ بەئافراندنی قورئان و توانای خەڵکانی (قەدەر: ئازادی خەڵك، هەڵبژاردنی کارەکان بەدەستی خۆیان) لەجەعد کوڕی درهەم فێر بوو لەگەڵ زانستەکانی دیکە. دەڵێن: جەعد پیاوێکی زەندیق بوو.

مەیمون کوڕی مێهران ئامۆژگاری کرد و جەعد وتی: شای شاکانی ئێمە قوباد، لای ئێمە خۆشەویستتر لەئایینەکەی ئێوەیە. وتی: خوا بتکوژێت کەدەتکوژێت. مەیمون لەزیانی ئەو شایەتیدا. هوشام ئەوی کرد وبۆ خالیدی قەسری نارد کەئەوی کوشت. خەڵك، مەروانیان بۆ شوێنکەوتنی ئەو، سەرکۆنە دەکرد.

مەروان سپی، سەرێکی گەورە، ریشێکی پڕ و درێژ و پەیکەرێکی ئەستووری بوو. پیاوێکی بەهێز و بوێر بوو بەو جیاوازییەی کەرۆژگاری کۆتایی هات و بوێری وبەهێزی هیچ سوودێکیان پێنەگەیاند.

ئەوکەسانەی لەئومەوییەکان کوژران

جارێك سودەیف ڕۆشتە لای سەفاح و سلێمان کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، لای ئەو دانیشتبوو لەبەر ئەوەی سەفاح ڕێزی لێدەگرت. سودەیف وتی:

| | |
|---|---|
| لا یغرنك ما تری من رجال | ان تحت الضلوع داءا دویا |
| فضع السیف و ارفع السوط حتی | لا تری فوق ظهرها امویا |

یانی: بەو لەهەندێ کەس دەیبینی، فریو مەخۆ چوونکە لەژێر پەراسووەکان، سینەیەکی لێوانلێو لەرق و کینەیە. قامچی هەڵگرە و شمشێر لەناویاندا بسوڕێنە تا لەسەرزەوی یەك ئومەوی نەبینی.

سلێمان وتی: پیرە پیاو منت بەکوشتدا. سەفاح ڕۆشتەژوور. سلێمانیان گرت و کوشتیان.

ڕۆژێك شیبل کوڕی عەبدوللە موالی بەنی هاشم ڕۆشتە لای عەبدوللە کوڕی عەلی و نەوەد پیاو لەسەر سفرەکەی دانیشتبوون کەخواردنیان دەخوارد: شیبل وتی:

| | |
|---|---|
| اصبح الملك ثابت الاساس | بالبها لیل من بنی عباس |
| طلبووا و تر هاشم فشفوها | بعد میل من الزمان و یاس |

لا تقیلن عبد شمس عثارا — و اقطعن کل رقلة و غراس
ذلها اظهر التو دد منها — و بها منکم کحر المواس
و لقد غاضنی و غاض سوائی — قربهم من نمارق و کراسی
انزلوها بحیث انزلها اللـ — ـه بدار الهوان و الاتعاس
و اذکروا مصرع الحسین و زیدا — و قتیلا بجانب المهراس
و القتیل الذی بحران اضحی — ثاویا بین غربة و قناس

یانی: پایەکانی پاشایەتی بەهێز و ئەمە بەهۆی پیرۆزی پیاوە چاکەکارەکانی بەنی عەباسەوە بوو. خوێن و تۆڵەی هاشمیان کردووە کەدوای سوران و تێپەرینی رۆژگارەکان بەم ئارەزوویان گەیشتن. هیچ هەڵەیەکی لەعەبد شەمس مەبەخشن و هەموو نەمامی دارخورماکان و دارخورماکان، لەرەگ و ریشە دەربێنن. ریسوایی ئەوان بۆتە هۆی ئەوەی لەخۆبووردوویی نیشان بدەن بەلاَم دڵیان وەك لێوی تیژی کێردەکان لەسەر قورگی ئێوەیە. من و کەسانیتر بەوە تورە بووین کەئەم گوناحکارانە پاڵیان بەتەخت و باڵشتەکانەوە داوە. ئەوان بۆ ئەو شوێنە بێننە خوار کەخواوەند ئەوانی دابەزاندوە: لەشوێنی وێران و شوێنی ریسواکان. کوژرانی حسەین بیر بێننەوە و گیان بەخشینی زەید و ئەو کوژراوەی لەکەرانی مێهراس بوو هەروەها کوژراوکەی حەران کەهاوئامێزی بێ ئاشنایی و فەرامۆشییە.

عەبدوالله فەرمانیدا بەگورز بیانکوژن. لەسەر ئەوان سفرەی چەرمینی راخست وگوێی لەناڵەناڵی ئەوان بوو تا ئەو کاتەی مردن. لەگەڵ ئەوەیشدا لەسەر جەستەی مردووەکان، نانی خوارد. فەرمانی بەعەبدوالله کوری عەلیدا گۆری ئومەوییەکان هەڵبدەنەوە. گۆری معاویە کوری ئەبوو سوفیانیان هەڵدایەوە و هیچیان جگە لەرشتەیەکی هاوشێوەی گەردنبەند، نەبینی. گۆری یەزید کوری معاویەیان هەڵدایەوە و کۆپەڵێك، خۆڵەمێشیان بینی. گۆری عەبدولەلیك کوری مەروانیان هەڵدایەوە و سەری ئەویان دۆزییەوە. لەگۆری یەك یەکی مردووەکان ئەندامەکانیان دەبینرا جگە لەگۆری هوشام کوری عەبدولەلیك کوری مەروان کەساخ و جگە لەنووکی لووتی، هێچ شوێنێکی دیکەی زیانی بەرنەکەوتبوو. قامچی بارانی کرد و لەداریدا و دواتر سوتاندی و خۆڵەمێشەکەی دایە دەم با.

شوێن ئومەوییەکان و خەلیفە زادەکان کەوت و یەك یەك ئەوانی گرت. جگە لەشیرەخۆرەیەك و هەلاَتوێك بۆ ئاندۆلۆس، کەس رزگاری نەبوو. ئەوانی لەسەر لێواری روباروی باوکی فوتورس کوشت. ئەم کەسانە لەناو کوژراوەکاندا دەبینران: محەممەد کوری

عەبدولمەلیك كوڕی مەروان، غومەر كوڕی یەزید كوڕی عەبدولمەلیك، عەبدواحید كوڕی سلێمان كوڕی عەبدولمەلیك، سەعید كوڕی عەبدولمەلیك كوڕی مەروان. دەستەیەك دەڵێن: پێشتر مردبوو، باوكی عوبەیدە كوڕی وەلید كوڕی عەبدولمەلیك و بەوتەی هەندێ كەس: ئیبراهیم كوڕی یەزیدی لەسەر كارلابراو. هەموو هێز و سامان و دارایی ئەوانی تالآن كرد. دواتر وتی:

بنی امیة قد افنیت جمعكم فكیف لی منكم بالاول الماضی
یطیب النفس ان النار یجمعكم عوضتم من نطاها شر معتاض
منیتم لا اقال الله عثرتكم بلیث غاب الی الاعداء نهاض
ان كان غیضی لفوت منكم فلقد منیت منكم بما ربی به ارض

یانی: ئەی ئومەوییەكان، دەستەكانی ئێوەم لەناو برد بەڵام چۆن دەستم بەیەكەمین و پێشانی ئێوە بكەوێت؟ دڵ فێنك وئاسوودە دەكات ئەوەی كەدۆزەخ هەمووتان پێكەوە كۆدەكاتەوە، خۆزگە لەزیانەكانی گەورەترین و قورسترینی بەئێوە ببڕێت. گرفتار بوون (خوا لەهەڵەكانتان خۆش نەبێت) بەشێرێكی دارستان كەزۆر بەتوندی هێرش دەكاتە سەر دوژمنان. ئەگەر توڕەیی و ڕقی من لەم ڕێگەوە فراوانە لەبەر ئەومیە مردن و گرفتار نەبوون. ئەمە ناتوانم بەحسێبی خوایی لەقەڵەم بدەم كەرەنج و ئازاری من بووە هۆی ڕەزامەندی خواوەند.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم هۆنراوەیە هی سودەیفە كە بۆ سەفاحی خوێندەوە و ئەو ڕووداوانەی لێكەوتەوە. سەفاح ئەوانی كوشت.

سلێمان كوڕی عەلی كوڕی عەبدوالله كوڕی عەباس، لەبەسرە دەستەیەكی لەئومەوییەكان كوشت كەجل و بەرگی بەزێرچنراوی گرانباییان لەبەر دەكرد. فەرمانیدا و قاچی ئەوانیان بەستەوە و بەسەر زەویدا رایكێشان و دواتر ئەوانی لەسەر ڕێگەكان فڕێدا تا سەگەكان بیانخۆن.

كاتێك ئومەوییەكان ئەمەیان بینی، ترسان و پەیوەندییە خزمایەتییەكانیان پچڕاند وئەوانەی توانییان، خۆیان شاردەوە. یەكێك لەوكەسانەی خۆی شاردەوە، عەمرۆ كوڕی معاویە كوڕی عەمرۆ كوڕی سوفیان كوڕی عوتبە كوڕی ئەبوو سوفیان بوو. دەڵێت: بۆ هەر شوێنێك دەڕۆشتم، دەناسرامەوە و زەوی بوو بەكونی مشك. ڕۆشتمە لای سلێمان كوڕی عەلی و ئەو منی نەناسییەوە. وتم: سووڕانی زەوی منی هێنایە ماڵەكەی تۆ و بۆ ئێرە، ڕێنوێنی

کردم. ئەگەر بمکوژێت، ئاسوودەم دەکەیت و ئەگەر بمگەڕێنیتەوە و تەندروست بمێنیت، ئەمانم پێدەبەخشرێت. وتی: تۆ کێیت؟ وتم: عەمرۆ کوڕی معاویە. وتی: بەخێر بێیت، چ نیازێکت هەیە؟ وتم: ئەو ژنانەی تۆ بۆ ئەوان لەهەموان شیاوتر و لەهەموان نزیکتریت، لەترسی ئێمە ترساون و هەر کەس بترسێت، ترس لای کەسانی خۆی دروست دەکات. وتی: زۆر گریا و دواتر وتی: خواوەند خوێنی تۆ دەپارێزێت و دارایی تۆ، بەخۆت دەبەخشێت و هاوسەرانی تۆ ئاسوودە دەکات. دواتر نامەی بۆ سەفاح نووسی: ئەی سەروەری باوەڕداران، میوانێك لەگەڵ هاورێکانی لەئومەوییەکان لای ئێمە دابەزیوە، ئەوانمان بەهۆی پچڕاندی پەیوەندییەکانیان کوشت نەك بەتاوانی خۆبەهێز کردن. ئێمە و ئەوان، عەبدمەناف، دەمانگەیەنێت بەیەك. خزمەکان دڵنەوایی دەکەن و نایانکوژن، پەیوەندییەکان بەهێز دەکەن و نایپچڕێنن. ئەگەر سەروەری باوەڕداران بەرەوای دەزانێت، ئەوان بەمن ببەخشێت. ئەگەر ئەو کارە بکات، باشترە فەرمانێك بۆ هەموو شارەکان بنووسێت تا بۆ بەخششینەکان و چاکەکارییەکانی لەگەڵ ئێمە، سپاسی خواوەند بکەین. سەفاح بەداواکارییەکەی رازی بوو. ئەمە یەکەم ئەمان بوو بەئومەوییەکان بەخشرا.

## نافەرمانی حەبیب کوڕی مورەی موڕی

لەم ساڵەدا حەبیب کوڕی مورەی موڕی نافەرمانی عەباسییەکانی کرد. خۆی و هاورێکانی لەخەڵکانی حەوران و بەسنییە سپییان پۆشی. نافەرمانی و سەرپێچی کردنی ئەوان پێش سەرپێچی کردنی ئەبوو وەرد بوو. عەبدوالله روبەرووی بوویەوە و چەندین جار شەڕی لەگەڵ کرد. حەبیب یەکێك بوو لەفەرماندەکان و سوارەکانی مەروان.

هۆکاری سپی پۆشینی ئەو، ترس بوو بۆگیانی خۆی و خەڵکەکەی. قەیسییەکان و موالییەکانی ئەوان، بەیعەتیان لەگەڵ کرد. کاتێك عەبدوالله ئاگادار بوویەوە کەباوکی وەرد شۆڕشی دەستپێکردووە و سپی دەپۆشێت، پێشنیاری ئاشتی بەحەبیب کرد. پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و ئەمانی بەخۆی و هاوەڵانی بەخشی و بۆ رووبەروو بوونەوەی باوکی وەرد، ڕەوانەی کرد.

## نافەرمانی باوکی وەرد و خەڵکانی دیمەشق

لەم ساڵەدا باوکی وەرد مەجزا کوڕی کەوسەر کوڕی زەفەر کوڕی حارسی کەلابی کە یەکێك بوو لەهاوەڵان و فەرماندەکانی مەروان، ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە.

هۆکاری ئەم کارەی ئەوە بوو کاتێك مەروان شکستی خوارد، باوکی وەرد لەقێنسرین شۆڕشی دەستپێکرد. عەبدوالله کوڕی عەلی ڕۆشتە ئەو شارە و باوکی وەرد، بەیعەتی لەگەڵ بەست و ملکەچی ئەو فەرمانە بوو کەسوپاکەی ملکەچ ببوون. مناڵەکانی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك لەبالس و ناعوورە، جیرانی بوون. لەبەر ئەمە یەکێك لەفەرماندەکانی عەبدوالله کوڕی عەلی هاتە شاری بالس و ژنان و مناڵەکانی مەسلەمەی ڕەوانە کرد. دەستەیەك لەوان سکالآیان لای باوکی وەرد بەرز کردەوە. ئەو لەگوندێك بەناوی خاف هاتەدەر و فەرماندەکەی عەبدوالله کوڕی عەلی و هەموو شەڕکەرەکانی کوشت و نافەرمانی فەرمانەکانی عەبدواللەی ئاشکرا و سپی پۆشی و پێشنیاری ئەو کارەی بەخەڵکانی قێنسریندا. خەڵکان هەموویان سپییان پۆشی. سەفاح لەم کاتەدا لەحیرە بوو. عەبدوالله کوڕی عەلی سەرقاڵی شەڕ کردن لەگەڵ حەبیب کوڕی مورەی موری لەسەرزەمینی بەلّقاء بوو کەپێشتر باسمان کرد.

کاتێك عەبدوالله ئاگادار بوویەوە کەئەوان سپییان پۆشیوە و ساڵح کوڕی حەبیب کوڕی مورەییان لەسەر کار لابردووە، بۆ شەڕ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ باوکی وەرد بەرێکەوت. لەدیمەشق تێپەڕی و باوکی غانم عەبدولحەمیدی کوڕی ڕێبعی تایی لەگەڵ چوارهەزار شەڕکەر، وەك جێگری خۆی لەم شارە، دەستنیشان کرد. بنەماڵە و ژنان و کەسەکانی عەبدوالله لەدیمەشق بوون. کاتێك ڕۆشتە حمس، خەڵکانی دیمەشق شۆڕشیان کرد و جل و بەرگی سپییان پۆشی و لەگەڵ عوسمان کوڕی عەبد ئەعلا کوڕی سوراقەی ئەزدی، ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و ڕووبەڕووی سوپاکەی باوکی غانم بوونەوە و شکستیان پێهێنان و شەڕکەرانیان، کوشتار و ماڵ و سامانی بەجێماوی عەبدواللەیان لەدیمەشق، تالآن کرد بەڵام ئازاری ژن و کەس وکارەکەی ئەویان نەدا. عەبدوالله بەرێکەوت و لەم کاتەدا دەستەیەك لەخەڵکانی قێنسرین لەدەوری باوکی وەرد کۆببوونەوە و نامەیان بۆ دراوسێکانی خۆیان لەخەڵکانی حمس و تەدمور نووسیبوو. لەخەڵکانی ئەم دووشارە، هەزاران پیاوی شەڕکەر بەفەرماندەیی باوکی محەممەد کوڕی

عەبدوالله كوڕی یەزید كوڕی معاویە بەرێكەوتن و فەرمانبەری ئەویان پێشنیاری كرد و وتیان: ئەمە ئەو سوفیانەیە كەبەردەوام باسی كراوە. نزیكەی چل هەزار پیاوی شەڕكەردەبوون و لە(مەرجی ئەخرەم) ئوردوویان لێدا. عەبدوالله كوڕی عەلی لێیان نزیك كەوتەوە و براكەی عەبدسەمەد كوڕی عەبدوڵلای لەگەڵ دەهەزار شەڕكەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە كرد. فەرماندەی سوپاكەی قێنسرین و فەرماندەی كاروباری تایبەت بەجەنگ، لەدەستی باوكی وەردەا بوو. بۆ شەڕی ئەوان ریزی بەست. كوژراوەكان لەهەردوو سوپاكە فراوان و عەبدسەمەد و سوپاكەی بڵاوەیان لێكرد و هەزاران كەسیان لێكوژرا. عەبدسەمەد بۆ لای عەبدوڵلای برای گەڕایەوە.

عەبدوالله و فەرماندەكان كۆبوونەوە و جارێكی دیكە لەمەرج ئەخرەم شەڕیان دەستپێكرد. عەبدوالله خۆڕاگری كردەپیشە و شەڕكەرانی ئەو، بوێرانە شەڕیان دەكرد. سوپاكەی باوكی وەرد شكستی خوارد و هەڵاتن. باوكی وەرد لەگەڵ پێنسەد كەس مایەوە و شەڕیان كرد تا كوژران. باوكی محەممەد و هاوەڵانی، هەڵاتن و پەیوەستی تەدمور بوون. عەبدوالله ئەمانی بەخەڵكانی قێنسرین بەخشی و ئەوان دووبارە، ڕەشیان پۆشی و بەیعەتیان لەگەڵ كرد و ملكەچی فەرمانەكانی بوون.

دواتر ڕووی كردە خەڵكانی دیمەشق كەبەمەبەستی دژایەتی كردنی ئەو، جل و بەرگی سپییان پۆشیبوو. كاتێك لێیان نزیك كەوتەوە، خەڵكان هەڵاتن و هیچ شەڕێك ڕووینەدا و عەبدوالله ئەمانی بەخەڵكانی شارەكە بەخشی و دووبارە بەیعەتی لێوەرگرتن. بۆ كارەكانیان، سزای نەدان.

باوكی محەممەدی سوفیانی بەهەمان شێوە بەنهێنی ژیانی بەسەر دەبرد و پەیوەستی سەرزەمینی حیجاز بوو. بەمشێوەیە تا ڕۆژگاری مەنسوری تاك دیناری مایەوە. زیاد كوڕی عەبدوڵلای حارسی كارگوزاری مەنسور لەشوێنی خۆشاردنەوەی ئەو، ئاگادار بوویەوە. چەندین سواری ڕەوانە و شەڕیان لەگەڵ كرد و كوشتییان و دوو كوڕەكەیان ئەسیر كرد. زیاد سەری سوفیانی (باوكی محەممەد كوڕی عەبدوالله )ی لەگەڵ دوو كوڕەكەی ڕەوانە كرد. مەنسوری ئەمانی بەدوو كوڕەكەی بەخشی و ئەوانی ئازاد كرد.

دەستەیەك دەڵێن: شەڕی عەبدوالله و باوكی وەرد لەكۆتایی زیحەجەی ١٣٢/ ٢٩ ژوئیەی ٧٥١ زایینی ڕوویدا.

## سپیپۆشی و نافەرمانی خەڵکانی جەزیرە

لەم ساڵەدا خەڵکی جەزیرە سپییان پۆشی و سەرپێچی فەرمانەکانی سەفاحیان کرد و بەرەو حەران بەرێکەوتن کەموسا کوڕی کەعب لەگەڵ سێ هەزار کەس لەشەڕکەرانی سەفاح، لەوێ بوو. گەمارۆیان خستە سەر. خەڵکی جەزیرە سەرکردە یا فەرماندەیەکیان نەبوو تا ئەوان لەدەروی یەك کۆبکاتەوە. لەم کاتەدا ئیسحاق کوڕی سەلەمی عەقیلی لەئەرمەنستانەوە هات. ئەو، لەکاتی بیستنی هەلاتنی مەروان، ئەرمەنستانی بەجێ هێشتبوو. خەڵکی جەزیرە لەدەوری ئەو کۆبوونەوە. ئیسحاق بۆ ماوەی دوو مانگ گەمارۆی خستە سەر موسا کوڕی کەعب.

باوکی عەباسی خوێنرێژ، ئەبوو جەعفەری برای و سوپاکەی ئەو لەواست بوون و گەمارۆیان خستبووە سەر کوڕی هوبەیرە، ڕەوانە کرد. ئەو، بەرێکەوت و لەقرقیسیا و رەقە تێپەڕی. خەڵکەکەی سپییان پۆشیبوو. ئیسحاق کوڕی سەلەم بۆ رەهاء کۆچی کرد و ئەمە لەساڵی ١٣٣/ ٧٥١ زایینی روویدا. موسا کوڕی کەعب لەحەڕان هاتەدەر و چاوی بەئەبوو جەعفەر کەوت.

ئیسحاق کوڕی سەلەم براکەی بەکار کوڕی سەلەمی بۆ لای خەڵکانی رەبیعە ڕەوانە کرد کە لەماردین و دارا نیشتەجێ بوون. ڕێبەری خەڵکانی رەبیعە لەم کاتەدا پیاوێکی حەروری بەناوی بوورەیکە بوو. ئەبوو جەعفەر بەرەو لای ئەوان پێشڕەوی کرد و رووبەروویان بوویەوە. بەو پەڕی هێزەوە، شەڕیان لەگەڵ کرد و بوورەیکە لەشەڕەکەدا کوژرا و بەکار بۆ لای ئیسحاقی برای گەڕایەوە. ئیسحاق ئەوی وەك جێگری خۆی دەستینشان و لەگەڵ زۆرینەی سوپاکەی بەرەو سومەیسات بەرێکەوت. ئەبووجەعفەر بەرەو رەهاء پێشڕەوی کرد و لەنێوان ئەو و بەکار، چەندین جار شەڕ روویدا.

پیاوی خوێنرێژ نامەی بۆ عەبدوالله کوڕی عەلی نووسی و ئەوی وەك فەرماندە دیاریکرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ سوپاکەی بەرەو سومەیسات بەرێکەوێت. ئەو ڕۆشت و لەبەرابەر ئیسحاق، لەسومەیستات، ئوردوی لێدا. شەست هەزار شەڕکەر لەناو سوپاکەی ئیسحاقدا دەبینرا. فورات لەنێوان دوو سوپاکەدا بوو.

ئەبوو جەعفەر لەرەهاء وەوە هات و بۆ ماوەی حەوت مانگ لەسومەیسات گەمارۆی خستە سەر ئیسحاق. ئیسحاق دەیوت: بەیعەتێکم لەئەستۆدایە و پشتگوێی ناخەم تا ئەو

کاتەی دەزانم خاوەنەکەی مردووە یا زیندوە.

ئەبووجەعفەر پەیامی بۆ نارد کەمەروان کوژراوە. ئیسحاق وتی: دڵنیا نیم. کاتێك لەکوشتنی مەروان دڵنیا بوو، داوای ئاشتی و ئەمانی کرد. بۆ ئەم پرسە نامەیان بۆ سەفاح نووسی و فەرمانی پێدان خۆی و سوپاکەی، ئەمان ببەخشن. بۆ ئەم کارە، پەیمانێکیان نووسی و ئیسحاق، بۆ سەردانی ئەبووجەعفەر بەرێکەوت. کەسانێکی لەگەڵدا بوو کەهاورێیەتی ئەویان دەکرد. خەڵکانی شام و جەزیرە، ملکەچ و گوێرایەڵی فەرمانەکان بوون. باوکی عەباس، ئەبوو جەعفەر مەنسوری تاك دیناری وەك فەرمانڕەوای جەزیرە، ئەرمەنستان و ئازەربایەجان، دەستنیشان کرد. لەو ناوچانە مایەوە تا ئەو کاتەی وەك خەلیفە هەڵبژێردرا.

دەستەیەك دەڵێن: عەبدوالله کوڕی عەلی بوو کەئەمانی بەئیسحاق بەخشی.

## کوژرانی باوکی سەلەمەی خەلال و سلێمان کوڕی کەسیر

پێشتر ئاماژەمان بەداستانی باوکی سەلەمەی خەلال و هەوڵەکانی ئەو بۆ هێنانە سەر کاری عەباسییەکاندا و باسمان کرد چ کەسانێك لەهاشمییەکان لەکاتی هاتن بۆ کوفە لەگەڵ ئەودا بوون بەهەمان شێوە کەگومانی خراپیان لێکرد. سەفاح لەو کاتەی لەحەمام ئەعیەن بوو، دڵی لەو گۆڕی و دواتر ئەو ناوچەی بەجێهێشت و گەیشتە شاری هاشمییەکان و لەم شارە، لەکۆشکی فەرمانداری دابەزی. بەهەمان شێوە ڕقی باوکی سەلەمەی لەدڵدا بوو. نامەی بۆ ئەبوموسلیم نووسی و بۆچوونەکەی خۆی لەگەڵدا باس کرد و بیری خستەوە کەچۆن باوکی سەلە، مەبەستی فێڵ کردن و فریودانی ئەوی لەسەردا بووە. ئەبوموسلیم نامەی بۆ نووسی: ئەگەر سەروەری باوەڕداران لەم کارە ئاگاداربۆتەوە، باشترە لەناوی ببات و خوێنی بڕێژێت.

داوود کوڕی عەلی بەسەفاحی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو کارە مەکە، لەبەر ئەوەی نەکا ئەبوموسلیم و خەڵکانی خوراسان ئەمە بکەنە بەڵگە و بیانوێك دژی تۆ، چوونکە کردەوەی ئەوان لەمبارەوە، هەمان کردەوە باوکی سەلەمەی خەلالە و لەلایەکی دیکە، زۆر لەو کەسانەی ئێستا لەدەوری تۆ کۆبوونەتەوە، ئەو کەسانەن کەشەیدای و دڵبەستەی ئەبوموسلیمن. لەجیاتی ئەم کارە نامە بۆ ئەبوموسلیم بنێرە تا ئەو بیکوژێت.

سەفاح، نامەی بۆ ئەبوموسلیم نووسی و ئەبوموسلیم، فەرمانی بەمەرار کوڕی ئەنسی زەببیدا، بیکوژێت. ئەو ڕۆشتە لای سەفاح و ئاگاداری کردەوە کەبۆ چ کارێك ڕەوانە کراوە. سەفاح فەرمانی بەجارچییەك دا کەجاڕیدا: سەروەری باوەڕداران لە باوکی سەلەم رازییە، ئەوی بانگ کردەوە و جل و بەرگی گرانبایی پێبەخشیوە. دوای ئەوە، شەوێك باوکی سەلەم ڕۆشتە لای سەفاح و لای ئەو مایەوە تا ئەوەی کاتێکی زۆر لەشەو بەسەرچوو. دواتر بەتەنیایی بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە. لەم کاتەدا ئەو پیاوە، مەرار کوڕی ئەنس و خەواریج، هێرشیان کردەسەری و خوێنیان ڕشت و وتیان: خەواریج ئەویان کوشت. بەیانی ئەو ڕۆژە، جەستەی باوکی سەلەمیان هێنایەدەر و یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی نوێژی لەسەر خوێندن. ئەویان لەشاری هاشمییەکان لەنزیك کوفە بەخاك سپارد. سلێمان کوڕی موهاجیری بەجلی لەمبارەوە وتی:

ان الوزیر وزیر آل محمد اودی فمن یشناك صار وزیرا

یانی: وەزیر، وەزیری بنەماڵەی محەممەد لەناوچوو، ئەو کەسەی تۆ بەدوژمن دەزانێت، بۆ وەزیری راسپێردرا.

باوکی سەلەیان بەوەزیری بنەماڵەی محەممەد ناو دەبرد و ئەبوموسلیمیان بەئەمیر بنەماڵەی محەممەد.

کاتێك باوکی سەلە کوژرا، سەفاح، ئەبووجەعفەری تاك دیناری بۆ لای ئەبوموسلیم ڕەوانە کرد. کاتێك ڕۆشتە لای ئەبوموسلیم، عوبەیداللە کوڕی حەسەنی ئەعرەج و سلێمان کوڕی کەسیر، هاوڕێیەتیان دەکرد. جارێك سلێمان بەعوبەیداللەی وت: ئەی پیاو، هیوامان دەبرد ئەم کارە بکەوێتە ئەستۆی بنەماڵەی ئێوە و دەوڵەتی ئێوە، سەقامگیر بێت. هەرکاتێك خوازیاری فەرمانڕەوایەتی بوون، ئێمە ئاگادار بکەنەوە. عوبەیداللە گومانی ئەو کرد ئەو بەکرێگیراوی ئەبوموسلیمە. لەبەر ئەمە ڕۆشتە لای ئەبوموسلیم و هەموو شتێکی بۆ باس کرد. ترسا ئەگەر ئەو ئاگادار بکاتەوە، ئەبوموسلیم، بیکوژێت. ئەبوموسلیم، سلێمان کوڕی کەسیری بانگ کرد و وتی: وتەکانی ڕێبەرت لەبیر ماوە کەفەرمووی: گومانت لەهەر کەسێك کرد، بیکوژە. وتی: بەڵێ. وتی: ئێستا گومانم لەتۆ هەیە. سلێمان وتی: سوێندت دەدەم بەخوا! وتی: سوێندم مەدە چوونکە تۆ مەبەستی فرت و فێڵت هەیە. دواتر فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

ئەبووجەعفەر بۆ لای سەففاح گەڕایەوە و پێی وت: ئەگەر ئەبوموسلیم نەکوژییت، هیچ کارەیت و فەرمانەکانت، ئەنجام نادرێت. وتی: چۆن؟. وتی: سوێند بەخوا، ئەوەی بخوازێت، ئەنجامی دەدات. باوکی عەباس وتی: ئەمە بەنهێنی بهێڵەرەوە.

دەستەیەك دەڵێن: پێش ئەوەی باوکی لەمە بکوژرێت، ئەبووجەعفەر بۆ لای ئەبوموسلیم ڕۆشت.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو: کاتێك سەففاح خۆی ئاشکرا کرد، لەگەڵ چەند کەسێك، ئاماژەی بەکارەکانی باوکی سەلەدا. یەکێك لەئامادەبووان وتی: ئەگەری هەیە ئەوەی ئەنجامی داوە، ئەندێشەی ئەبوموسلیم بێت. سەففاح وتی: ئەگەر ئەم کارە ئەندێشەی ئەو بێت، لەهیچ ئاژاوەیەك ناترسین مەگەر ئەوەی خواوەند، زیانەکەی لەسەر ئێمە هەڵبگرێت. باوکی مەنسوری برای بۆ لای ئەبوموسلیم ڕەوانە کرد تا لەئەندێشە و بۆچوونی ئەو ئاگادار ببێتەوە. ئەو ڕۆشت و ئەبوموسلیمی لەکارەکانی باوکی سەلە ئاگادار کردەوە. ئەبوموسلیم، مەرار کوڕی ئەنسی ڕەوانە کرد و ئەوی کوشت.

## گەمارۆ خستنە سەر کوڕی هوبەیرە لەواست

پێشتر باسی کارەکانی یەزید کوڕی هوبەیرە و ئەو سوپاکەی خەڵکانی خوراسان کەرووبەرووی قەحتەبە بوونەوە و دواتر لەگەڵ کوڕەکەی شەڕیان کرد، کرد و ئاماژەمان بەوەدا کەئەو، شکستی خوارد و بۆ واست، هەڵات و لەوێ سەنگەری گرت. کاتێك هەڵات، کەسانێکی بۆ کۆکردنەوەی سامانە تاڵان کراوەکانی شەڕ راسپارد و ئەوان کۆیان کردەوە و لەگەڵ خۆیان بردیان. حەوسەرە پێی وت: فەرماندەی ئەوان کوژراوە، بۆ کوێ دەڕۆیت؟ مەبەستی قەحتەبە بوو. بەرەو کوفە بەرێکەوە چوونکە سوپایەکی فراوان و شەڕکەرانی بێزار نەبووت لەگەڵدایە. شەڕیان لەگەڵ بکە تا سەرکەوتن بەدەست دێنیت یا دەکوژرێیت. وتی: ئەو کارە ناکەم. بەڵکو دەڕۆمە واست و سەیری سوڕانی کارەکان و چاوەڕوانی ئەنجامەکان دەکەم. وتی: پێش ئەمە هیچ کارێك ناکەیت چوونکە دەستی ئەوت بۆ سەر خۆت ئاوەڵا کرد تا لەناوت ببات.

یەحیا کوڕی حوزەین وتی: تۆ هیچ کات دیاریەکی گرانبایتر لەمە بۆ مەروانی ئومەوی نابەیت. پشت بەفورات ببەستە تا پەیوەستی ئەو دەبیت. ئاگاداربە نەڕۆیتە واست چوونکە گەمارۆت دەخەنە سەر و دوای ئەوە، تەنیا کوژران لەبەردەم تۆدا دەبێت.

ئەو لەمەروان دەترسا چوونکە مەروان نامەی بۆ دەنووسی و فەرمانی پێدەدا و ئەم نافەرمانی دەکرد لەبەر ئەمە ترسا، مەروان بیکوژێت. ڕۆشتە واست و سەنگەری گرت. باوکی سەلە، حەسەن کوڕی قەحتەبەی بۆ لەناو بردنی ئەو، ڕەوانە کرد و گەمارۆی خستە سەر شارەکە. یەکەم شەڕیان لەرۆژی چوارشەممە، روویدا. خەڵکانی شام بەکوڕی هوبەیرەیان وت: فەرمانمان پێبدە تا شەڕ بکەین. فەرمانی پێدان و رووبەرووی سوپاکەی کوڕی قەحتەبە بوونەوە. کوڕی هوبەیرە هاتەدەر. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی کوڕی داوود بوو. هەردوو لای شەڕکەر رووبەرووی یەك بوونەوە. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی حەسەن، خازم کوڕی خەزیمە بوو. خازم هێرشی کردە سەر کوڕی هوبەیرە. خۆی و هاوەڵانی هەڵاتن و دەروازەی شارەکە، لێوانلێو بوو لەشەڕکەران. هاوەڵانی کەشکەنجیرەکانیان هەڵبەست و خەڵکانی شام پاشەکشێیان کرد. حەسەن هێرشی کردەسەریان وبۆ دیجلە، دووری خستنەوە و کەسانێکی زۆر لەوان، لەناو ئاوەکەدا خنکان. ئەوانیان بەکەشتییەکان دەوردەدا و رێگاکانیان بەست. حەوت رۆژیتر چاوەڕوان بوون. دواتر بەمەبەستی شەڕ کردن ریزیان بەست و شەڕیان دەستپێکرد بەڵام رووبەرووی شکستێکی گەورە بوونەوە و بۆ ناو شارەکە، گەڕانەوە. رۆژگارێکی درێژ بەمشێوەیە مانەوە و تەنیا یەکتریان تیرباران دەکرد.

کوڕی هوبەیرە (بەهەمان شێوە کەگەمارۆی لەسەر بوو) بیستی باوکی ئومەییەی تەغلەبی ڕەشی پۆشیوە. ئەوی گرت و زیندانی کرد. مەعن کوڕی زایدەی شەیبانی و کەسانێك لەرەبیعە سەبارەت بەو، لەگەڵ کوڕی هوبەیرە گفتوگۆیان کرد و سێ کەس لەخەڵکی فەزارە (هۆزی کوڕی هوبەیرە)یان گرت و زیندانییان کردن. جوێنیان بەکوڕی هوبەیرەدا و وتیان: ئەسیرەکان ئازاد ناکەین تا ئەو کاتەی کوڕی هوبەیرە، هاورێکەی ئێمە ئازاد دەکات. کوڕی هوبەیرە رازی نەبوو، ئەسیرەکەی ئازاد بکات. مەعن و عەبدولرەحمان کوڕی بەشیر عیجلی و هاوەڵانی ئەم دووانە، لەدەوری کوڕی هوبەیرە، بڵاوەیان لێکرد. بەکوڕی هوبەیرە وترا: ئەوان پاڵەوانە سوارەکارەکانی تۆن کەتۆیان بەجێهێشت، ئەگەر لەسەر کارەکەی خۆت پێداگری بکەیت، ئەم کەسانەی گەمارۆیان خستۆتە سەرتۆ، زیاتر سوور دەبن. کوڕی هوبەیرە، کوڕی ئومەییەی بانگ کرد و جل و بەرگی گرانبایی پێبەخشی و ئەوی بۆ بنەماڵەکەی گەڕاندەوە. ئەوان ئاشت بوونەوە.

لەم کاتەدا نەسر کوڕی مالك کوڕی هەیسەم لەپانتاییەکانی سیستانەوە، گەیشتە لای حەسەن. حەسەن دەستەیەکی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای سەفاح ڕەوانە و پەیامیدا

کەباوکی نەسر بۆ لای ئەو هاتووە. ئەو، غەیلان کوڕی عەبدوللەی خوزاعی وەك سەرپەرەستی شاندی نوێنەرایەتی دیاریکرد بەڵام غەیلان لەحەسەن ڕەنجا بوو چوونکە ئەوی وەك بەردەست بۆ لای ڕەوح کوڕی حاتەم، ڕەوانە کردبوو. کاتێك غەیلان ڕۆشتە لای سەفاح، سڵاوی بۆ نارد و وتی: شایەتی دەدەم تۆ سەرووەری باوەڕداران و ڕشتەی پەیوەندی بەهێزی نێوان یەزدان و ڕێبەری خوپارێزانی. وتی: غەیلان، نیازەکانت چین؟ غەیلان وتی: داوا دەکەم، داوای بەخشینی من بکەیت و بەبەڵگەکانی من رازی بیت. وتی: خوا لێت خۆش بێت. غەیلان وتی: ئەی سەرووەری باوەڕداران، منەتمان سەربکە و پیاوێك لەبنەماڵەکەت وەك فەرماندەی ئێمە دەستنیشان بکە و چاوەکانی ئێمە بەو، ڕووناك بکەرەوە. ئەو، براکەی ئەبووجەعفەر مەنسوری تاك دیناری کەتازە لەخوراسان گەڕابوویەوە، بۆ شەڕی کوڕی هوبەیرە ڕەوانە کرد. پەیامی بۆ حەسەن نارد و وتی: سوپاکە هی تۆیە و فەرماندەکانی لەژێر دەستی تۆدان، بەڵام حەزم کرد براکەم لەوێ ئامادە بێت، گوێڕایەڵ بە و فەرمانەکانی ئەنجام بدە و بەگیان و دڵ، هاوکاری بکە. هەروەها ئەم پەیامەی بۆ مالك کوڕی هەیسەم نووسی. لەبەر ئەمە هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانی ئەم سوپایە، لەئەستۆی حەسەندا بوو.،

کاتێك مەنسور گەیشتە لای حەسەن، لەخێوەتەکەی خۆی هاتەدەر و مەنسوری لەخێوەتەکەی خۆی دانیشاند و عوسمان کوڕی نەهیکی وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی دەستنیشان کرد.

مالك کوڕی هەیسەم، ڕۆژێکی تەواو، لەگەڵ ئەوان شەڕی کرد و خەڵکانی شام پاشەکشێ و ڕوویان کردە سەنگەرەکانی خۆیان. مەعن کوڕی زایدەی شەیبانی و باوکی یەحیا جوزامی لەسەر ڕێگەی ئەوان دانیشتبوون. کاتێك هاوەڵانی مالك لەبەردەم ئەوان تێپەڕین، لەشوێنەکانی خۆیان هاتنەدەر و هێرشیان کردنەسەر. کوڕی هوبەیرە لەبوورجی خەلالین بوو. شەویان بەشەڕ کردن بەسەر برد. کوڕی هوبەیرە کەسی بۆ لایب مەعن نارد و فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە. گەڕایەوە. هەردوو لای شەڕکەر، چەند ڕۆژێك چاوەڕێیان کرد. دواتر خەڵکانی واست لەگەل مەعن و محەممەد کوڕی نوباتە هاتنەدەر. شەڕکەرانی حەسەن ڕووبەڕوویان بوونەوە و شکستیان پێهێنان و بەرەو فورات پاشەکشێیان پێ کردن. گەڕانەوە و بینیان کوڕی مالك کوڕی هەیسەم کوژراوە. کاتێك باوکی جەستەی کوژراوی ئەوی بینی، وتی: دوای تۆ، نفرین و نەحلەت لەژیان. هێرشیان کردە سەر خەڵکانی واست و شەڕیان دەست پێکرد و بۆ ناو شارەکە، پاشەکشێیان پێکردن.

مالك بەردەوام کەشتییەکانی پڕدەکرد لەدار و چیلکە و دەیسوتاند. کوڕی هوبەیرە ئەم کەشتییانە بەقولاب، دەردەهێنایەوە. پانزە ڕۆژیان بەمشێوەیە بەسەر برد.

کاتێك بازنەی گەمارۆدانەکە، گوشاری خستنەسەرو گرفتارییەکان زیادی کرد، خوازیاری ئاشتی بوون. داوای پەیمانی ئاشتییان نەکرد مەگەر ئەو کاتەی هەواڵی کوژرانی مەروانیان بیست. ئیسماعیل کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری، لەکوژرانی مەروان ئاگاداری کردنەوە و وتی: مەروان کوژراوە، بۆچ مەبەست و ئارمانێك شەڕ دەکەن؟ هاوەڵانی کوڕی هوبەیرە، هێرشیان کردەسەر. یەمانییەکان وتیان: هاوکاری مەروان ناکەین چوونکە ئەنجامی کردەوەکانی ئەو لەناو ئێمەدا ئەوە بوو کەهەمیشە هەیە. خەڵکانی نەزار وتیان: شەڕ ناکەین تا ئەو کاتەی خەڵکانی یەمان شان بەشانی ئێمە، شەڕ بکەن. هەژارەکانی خەڵك و گەنجەکان، بۆ هاوکاری کردنی ئەو، دەجەنگان.

کوڕی هوبەیرە بڕیاریدا خەڵکان بۆ ڕازی بوون بەفەرمانەکانی محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە حەسەن کوڕی عەلی، هانبدات. نامەی بۆ نووسی بەڵام وەڵامەکەی درەنگ دەستکەوتووە. سەفاح نامەی بۆ یەمانییەکانی سوپاکەی هوبەیرە نووسی و تەماحی ئەوانی زیاد کرد. زیاد کوڕی ساڵح و زیاد کوڕی عەبدوڵڵە بۆ لای سەفاح بەڕێکەوتن و بەڵێنیان بەکوڕی هوبەیرەدا، ڕەزامەندی باوکی عەباس بەدەست بێنن، بەڵام نەیانکرد. لەولایش، پەیك و نامەکان لەنێوان کوڕی هوبەیرە و ئەبووجەعفەر، هاتوچۆیان دەکرد. مەنسوری تاك دیناری ئەمانی بەکوڕی هوبەیرە بەخشی و نامەیەکی لەمبارەوە نووسی. کوڕی هوبەیرە چل ڕۆژ چاوەڕێی و لەگەڵ زانا و گەورەکانی خەڵك، ڕاوێژی کرد. دواتر ڕازی بوو و ئەبووجەعفەری لەڕەزامەندی خۆی ئاگادار کردەوە. ئەبووجەعفەر نامەکەی بۆ لای سەفاحی برای ڕەوانە کرد و سەفاح فەرمانی بەمەنسوردا ڕێز لەپەیمان نامەکە بگرێت و بەڵێنەکانی بباتەسەر.

کاتێك پەیمانی ئەمان بەخشینەکە کۆتایی پێهات، کوڕی هوبەیرە لەگەڵ هەزار و سێسەد کەس لەخەڵکانی بووخارا، بۆ لای ئەبووجەعفەر بەڕێکەوت. ویستی سوار ماینەکەی خۆی بڕواتە لای. دەرگاوان، سەلام کوڕی سەلیم، هەستا و وتی: بەخێر بێیت باوکی خالید، بەخۆشی و تەندروستی دابەزە. دابەزی. دەوروبەری خێوەتەکەی مەنسور بەدەهەزار کەس لەخوراسانییەکان دەپارێزرا. دۆشەکێکیان هێنا و لەسەری دانیشت. فەرمانەکانیان بردە ژوور و دواتر بەتەنیایی کوڕی هوبەیرەی، بانگ کردە ژوور. کوڕی هوبەیرە، دەڕۆشتە لای و

کاژێرێك گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد. دواتر چاوەڕێ دەبوو. ڕۆژێك دەڕۆشت و ڕۆژێك نەدەڕۆشت. هەموو جارێك لەگەڵ پێنسەد سوار و پیادە دەڕۆشتە لای. بەئەبووجەعفەریان وت: کوڕی هوبەیرە دێت و سوپاییەکان کوڕنوشی بۆ دەبەن وەك بڵێی گەورەیی و ڕێزی خۆی لەدەست نەداوە. ئەبووجەعفەر فەرمانی پێدا تەنیا لەگەڵ کەسە نزیکەکانی سەردانی بکات. کوڕی هوبەیرە لەگەڵ سی کەس دەڕۆشتە لای و هێندی هێندی ژمارەیان بۆ سێ و چوار کەس، کەمی کرد.

کوڕی هوبەیرە ڕۆژێك لەگەڵ مەنسور دەپەیڤی و لەناو قسەکانیدا وتی: هێی( یا ئەی پیاو) دواتر لەوتەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە وتی: سەروەرەم، تاماوەیەك پێش ئێستا بەم شێوەیە قسەم لەگەڵ خەڵکان دەکرد. لەزارم دەرچوو و وتەیەکی نەشیاوە. سەفاح، زەختی لەباوکی جەعفەر کرد تا کوڕی هوبەیرە بکوژێت. مەنسور داوای لێکرد بیبەخشێت. سەرئەنجام سەفاح نامەی نووسی و وتی: یا بێ دەرنگ خوێنی دەرێژیت یا کەس دەنێرم تا ئەو لەخێوەتەکەی تۆ بێنێتەدەر و خوێنی برێژێت.

مەنسور بڕیاریدا بیکوژێت. خازم کوڕی خەزیمەی لەگەڵ هەیسەم کوڕی شوعبە کوڕی زوهەیر ڕەوانە کرد و دەرگای گەنجینەکانیان مۆر کرد. دواتر کەسی بۆ لای گەورەکانی هاوەڵانی کوڕی هوبەیرە لەخەڵکانی قەیس و موزەرنارد و ئەوانی بانگێشت کرد. حەوسەرە کوڕی سوهەیل و محەممەد کوڕی نوباتە لەگەڵ بیست و دوو کەسی دیکە بۆ لای ئەو ڕۆشتن. سەلامە کوڕی سەلیم هات و وتی: حەوسەرە و کوڕی نوباتە لەکوێن؟ ئەم دووانە ڕۆشتنە ژوور. ئەبووجەعفەر، عوسمان کوڕی نەهیکی لەگەڵ سەد شمشێر وەشێن لەناو خێوەتەکەی خۆی دانابوو. شمشێرەکانی ئەو دووانەیان گرت و شانیان بەستنەوە. دواتر کەسانی دیکەی بەم شێوەیە دوو کەس دوو کەس بانگ دەکرد و شمشێرەکانیان لێدەستاندن و شانیان دەبەستنەوە. یەکێك لەوان وتی: پەیمانی خواییتان بەئێمەدا و ئێستا پەیمانەکەی خۆتان دەشکێنن. هیوادارم خۆا، تۆڵەتان لێبکاتەوە. کوڕی نوباتە دەستی بەڕیشی خۆیدا دەهێنا و دەیوت: پێشتر چاوەڕوانی ئەمەم دەکرد.

خازم و هەیسەم لەگەڵ سەد شەڕکەر بۆ کوشتنی کوڕی هوبەیرە بەرێکەوتن و وتیان: دەمانەوێت سامانەکان هەڵبگرین. بەدەرگاوانەکەی وت: ڕێگەی گەنجینەیان نیشان بدە. ئەوان لەبەرابەر هەرماڵێك چەند کەسێکان دانا و هێرشیان کردە سەر خۆی و کوڕەکەی داوود و ژمارەیەك لەکۆیلەکانی. کوڕێکی منداڵ لەسەر باوەشی بوو. کاتێك هێرشیان کرد،

دەرگاوانەکەی، خۆڕاگری کرد. هەیسەم کوڕی شوعبە بەشمشێر شادەماری ملی قرتاند و ئەوی کوشت. کوڕەکەی داوود شەڕی دەستپێکرد و ئەو، کوڕە بچوکەکەی لەسەر کۆشی دوور خستەوە و وتی: دەست لەم کوڕە هەڵبگرن. سەری خستە سەرزەوی و ئەوان، سەریان بڕی. سەری ئەوانیان بردە لای ئەبووجەعفەر. ئەو، ئەمانی بەهەموو خەڵکان بەخشی جگە لەعەبدەمەلیك کوڕی بیشر و خالید کوڕی سەلەی مەخزومی و عەمرۆ کوڕی زەر. زیاد کوڕی عەبدوالله بۆ کوڕی زەڕ داوای ئەمانی کردج. مەنسور ئەمانی پێبەخشی، حەکەم هەڵات و ئەبووجەعفەر ئەمانی بەخالید بەخشی بەڵام سەفاح ئەوی کوشت و گرنگی بەئەمانەکەی ئەبووجەعفەر نەدا. باوکی عەتای هیندی لەپرسەی کوڕی هوبەیرەدا وتی:

الا ان عینا لم تجد یوم واسط   علیك بجاری دمعها لجمود
عشیة قم النائحات و صفقت   اکف بایدی مأتم و خدود
فان تمس مهجور الفناء فربما   اقام به بعد الوفود وفود
فانك لم تبعد علی متعهد   بلی کل من تحت التراب بعید

یانی: ئەو چاوەی لەشەڕی واست بارانی فرمێسك بۆ تۆ نەبارێنێت، وەك سەرچاوەیەکی وشك لەقەڵەم دەدرێت. ئەو ئێوارێ کەژنانی شینگێڕ، پرسەیان گێڕا و بەچنگ و نینۆك، روخساری وەك گوڵی خۆیان بریندار دەکرد. ئەگەر ماڵەکەت لەمیوانەکان چۆڵ بێت، ترسمان نییە چوونکە هەموان دەزانن لەکاتی ژیانی تۆ، دەستەی میوانەکان یەك لەدوای یەك دادەبەزین و خەمخۆرێکیان دەبینی. تۆ خۆت لەو کەسانە نەشاردەوە و روخساری خۆت دانەپۆشی کەتازە چاویان بەتۆ کەوتبێت، چوونکە هەر کەس لەژێر خاکدا بخەوێت، زۆر بەدوور لەقەڵەم دەدرێت.

## کوژرانی کارگوزاری باوکی سەلە لە پارس

لەم ساڵەدا ئەبوموسلیمی خوراسانی، محەممەد کوڕی ئەشعەسی وەك فەرمانداری پارس ڕەوانە و فەرمانی پێدا هاوەڵان و کارگوزارانی باوکی سەلەی سرکەفرۆش، کوشتار بکات. ئەو کارەی کرد. سەفاح، مامی خۆی عیسای بۆ پارس ڕەوانە کرد کەمحەممەد کوڕی ئەشعەس فەمانڕەواکەی بووەو. محەممەد بڕیاریدا عیسا بکوژێت بەڵام پێیان وت: ئەم کارە بۆ تۆ ڕەوا نییە. وتی: ڕەوایە چوونکە ئەبوموسلیم فەرمانی پێداوم هەرکەس هات و خوازیاری فەرمانداری بوو، بیکوژم. عیسای لەترسی دەرئەنجامەکان، نەکوشت. سوێند و

پەیمانی بەهێزی لەعیسا وەرگرت کەهەرگیز نەڕواتە سەر تەختی وتاردان و شمشێر لەکەمەر نەبەستێت مەگەر بۆ شەڕ کردن لەڕێگەی خوا. دوای ئەوە،عیسا هیچ کات شمشێری لەکەمەر نەبەست و کاروباری فەرمانڕەوایەتی نەگرتەدەست. سەفاح، ئیسماعیل کوڕی عەلی وەك فەرمانداری پارس ڕەوانە کرد.

## فەرمانڕەوایەتی یەحیا کوڕی محەممەد لەموسڵ و گێڕانەوەکان لەمبارەوە

لەمساڵەدا سەفاح، براکەی خۆی یەحیا کوڕی محەممەدی وەك فەرماندار لەجیاتی محەممەد کوڕی سول، ڕەوانە کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو کەخەڵکانی موسڵ بەفەرمانڕەوایەتی محەممەد کوڕی سوڵ رازی نەبوون و وتیان: دەبێت موالی خەسعەم فەرمانداری ئێمە بێت. ئەویان دەرکرد. محەممەد، نامەی بۆ سەفاح نووسی و لەم کارە ئاگاداری کردەوە. سەفاح، یەحیای برای وەك فەرمانداری ئەم شارە دەستنیشان و دوانزە هەزار پیاوی شەڕکەری خستە بەردەست. ئەو هات و لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی لەتەنیشت مزگەوتی گشتی، دابەزی. هیچ کارێکی لەبەرابەر خەڵکانی موسڵ ئەنجام نەدا کە بەناپەسەندی بزانن. دواتر ئەوانی بانگ کرد و دوانزە کەس لەوانی کوشت. خەڵکی شار ترسان و کەل و پەلی شەڕیان هەڵگرت بەلأم ئەمانی پێبەخشین و فەرمانیدا کەجاڕیاندا: هەرکەس بڕواتە ناو مزگەوتی گشتی، ئەمانی هەیە. خەڵك بەپەلە بەرەو مزگەوتەکە بەڕێکەوتن. یەحیا پیاوانی لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەدانا کە بێ بەزەییانە خەڵکیان کوشتار کرد و خوێنرێژیان لەرادەبەدەر کرد. مزگەوتەکەیان کردە دەریایەکی خوێن. دەڵێن: پانزە هەزار کەسی کوشت و تۆماری ژیانی زۆر لەخەڵکانی کۆتایی پێهێنا چ ئەوانەی ئەنگوستیلەیان لەدەستا بوو چ ئەوانەی نەیانبوو.

کاتێك شەو داهات، یەحیا دەنگی شین و گریانی ئەو ژنانەی بیست کەپیاوەکانیان کوژرا بوون. لەهۆکاری شین و گریانەکەی پرسی و ئاگاداریان کردەوە. وتی: کاتێك هەتاو، هەڵهات، ژنان و منالأن کوشتار بکەن. ئەو کارەیان کرد و سێ ڕۆژیان بەکوشتار ژن و منالەکان بەسەر برد. فەرمانەدەیەك لەناو سوپاکەیدا دەبینرا کەچوار هەزار ڕەشپێستی

لەژێر دەستا بوو. ئەوان ژمارەیەکی زۆری ژنانیان دزی و لەگەڵ خۆیان بردیان.

کاتێك یەحیا ڕۆژی سێیەمی بەکوشتاری بەکۆمەڵ بەسەر برد، لەڕۆژی چوارەم نزیك کەوتەوە و لەپێش خۆیەوە شمشێر دەرکێشراوەکان دەبینران. ژنێك ڕێگەی لێ بەست وجڵەوی ئەسپەکەی گرت. هاوەڵانی بڕیاریاندا ژنەکە بکوژن بەڵام یەحیا، ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن. ژنەکە پێی وت: ئایا تۆ لەهاشمییەکان نیت؟ ئایا ئامۆزای پێغەمبەر(د.خ) نیت؟ پێت عەیب نییە ژنە سەرفەرازەکانی عەرەب بەدەستی ڕەشپێستەکان دەرفێندرێن؟ یەحیا نەیتوانی وەڵامی بداتەوە و کەسی ڕەوانە کرد تا شوێنی مانەوەی خۆی نیشان بدات چوونکە وتەکانی کاریگەری لەسەر ئەودانا. کاتێك بەیانی داهات، ڕەشپێستەکانی کۆکردەوە تا کرێکیان پێبدات. کۆبوونەوە. فەرمانی کوشتاری بەکۆمەڵی ئەوانی دەرکرد و تەنانەت یەك کەس لەوان بەزیندووی ڕزگاری نەبوو.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری کوشتنی خەڵکانی موسڵ، کردەوەکانی خۆیان بوو. وەك بڵێی هاوڕێی ئومەوییەکان و دوژمنی عەباسییەکان بوون. دەڵێن: ژنێك سەری خۆی شۆرد و کەفاوەکەی لەسەر بانەکەیەوە ڕژاندە خوار و بەر سەری یەکێك لەخوراسانییەکان کەوت. گومانی کرد بەئەنقەست ئەو کارەی کردووە. ڕۆشتە ناو ماڵەکە و کەسانی ناو ماڵەکەی کوشت. خەڵکی شار شۆڕشیان دەستپێکرد و ئەویان کوشت و بەمشێوەیە ئاژاوە، بڵێسەی سەند.

یەکێك لەکوژراوەکان مەعروف کوڕی ئەبی مەعروف بوو کە بەپیاوێکی خواپەرەست و خۆپارێز دەناسرا. زۆر لەهاوەڵانی پێغەمبەری بینیبوو و وتاری ئەوانی بیستبوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا سەفاح، مەنسوری تاك دیناری برای وەك فەرمانداری جەزیرە و ئەرمەنستان و ئازەربایەجان، ڕەوانە کرد. هەروەها لەم ساڵەدا فەرمانداری سواد و کوفەی لەمامی سەندەوە وئەوی وەك فەرمانداری مەککە و یەمەن و یەمامە و مەدینە، دەستنیشان کرد. لەجێگەکەی ئەو، برازاکەی، عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەدی وەك فەرمانداری کوفە، دیاریکرد سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفەی بەباوکی لەیلی سپارد.

کارگوزاری بەسرە، لەم ساڵەدا سوفیان کوڕی عۆیەیینەی مەهلەبی بوو وسەرپەرەستی

دامەزراوەی داد، حەجاج کوڕی ئەرتاق، فەرمانداری سند، مەنسور کوڕی جمهور، فەرمانداری پارس، محەممەد کوڕی ئەشعەس، فەرمانداری جەزیرە و ئەرمەنستان و ئازەربایەجان، ئەبووجەعفەر محەممەد کوڕی عەلی، فەرمانداری موسڵ، یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی، فەرمانڕەوای شام عەبدوالله کوڕی عەلی، فەمانداری میسر، باوکی عەون عەبدولمەلیك کوڕی یەزید، فەرمانداری خوراسان و کوێستانەکان ئەبوموسلیم و سەرپەرەستی دیوان، خالید کوڕی بەرمەك بوو.

لەم ساڵەدا داوود کوڕی عەلی ئاییی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن یا کوژران: عەبدوالله کوڕی ئەبی نوجەیح، ئیسحاق کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەبی تەڵحەی ئەنساری، یەحیا کوڕی معاویە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ مەروان کوڕی محەممەد کەهەردووکیان لەزاب کوژران، یەحیا کوڕی عەبدولرەحمان برای عەبدولرەحمان کە لەناو شاری ئاندۆلۆس کوژرا، یونس کوڕی موغەیرە کوڕی حەلین لەدیمەشق و کاتێك عەبدوالله کوڕی عەلی ڕۆشتە ئەم شارە و ئەوی، لەوێ کوشت، ساڵەکانی ژیانی سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا، دوو پیاوی خوراسانی ئەویان کوشت کەنەیاندەناسی و کاتێك ناسیانەوە، بۆی گریان. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوەیە نەبوو بەڵکو چوارپێیەك گازی لێگرت و کوشتی. ئەو، سۆمای چاوەکانی لەدەست دابوو. سەفوان کوڕی سولەیم موالی حومەید کوڕی عەبدولرەحمان، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم لەمەدینە کەدادیار بوو، هومام کوڕی مونبە، عەبدوالله کوڕی عەوف، سەعید کوڕی سلێمان کوڕی زەید کوڕی سابتی ئەنساری، خوبەیب کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی خوبەیب کوڕی یەساری ئەنساری خاڵی عوبەیدالله کوڕی عومەری عومەری، عومارە کوڕی ئەبی حەفسە کەناوی (باوکی حەفسەیە)، سابت موالی عەتیك کوڕی ئەزد و ئەو باوکی حەرەمی بەنازناوی باوکی ڕوەح بوو، عەبدوالله کوڕی تاووس کوڕی کەیسانی هەمەدانی لەخواپەرەستان و خۆپارێزان و باوەڕدارانی یەمەن.

# ڕووداوەکانی ساڵی سەدو سیی و سێی کۆچی(( ٧٥٠- ٧٥١ زایینی ))

## زاڵبوونی ڕۆمییەکان بەسەر مەڵتییە

لەم ساڵەدا کۆنستانتین پاشای ڕۆم هێرشی کردە سەر کەمخ و مەڵتییە. سەرەتا لەگەڵ خەڵکی کەمخ شەڕی کردو ئەوان پەیك و پەیامیان بۆ خەڵکانی مەڵتییە ڕەوانە و داوای هاوکارییان لێکردن. هەشسەد پیاوی شەڕکەر لەمەڵتییەوە بەرەو کەرخ بەرێکەوتن. پاشای ڕۆم ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئەوان شکستیان خوارد و هەلاتن. ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر شەڕکەرانی مەڵتییە و دەوریان گرتن. ئەم دوورگەیە لەم کاتەدا گرفتاری ئاژاوەیەك بوو کەباسمان کرد. کارگوزارەکەی، موسا کوڕی کەعب، لەحەڕان بوو.

کۆنستانتین پەیامی بۆ خەڵکانی مەڵتییە نارد: من تەنیا بەئاگادار بوونی موسوڵمانان و بەهۆکاری ناسازگاری ئەوان لەناو خۆیان، گەمارۆم خستۆتە سەر ئێوە. ئێوە ئەمانتان پێبەخشراوە تا بۆ وڵاتە ئیسلامییەکان بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی دەست بەسەر مەڵتییەدا بگرم و وێرانی بکەم. ئەوان ڕازی نەبوون. کۆنستانتین، کەشکەنجیرەکانی هەڵبەست. موسوڵمانەکان ڕازی بوون و شارەکەی خۆیان بەمەرجی ئەمان بەخشین، تەسلیم کرد و ڕوویان لەسەرزەمینە ئیسلامییەکان کرد. ئەوەی توانییان لەگەڵ خۆیان بردیان و ئەوەی نەیانتوانی، خستیانە ناو چاڵ و ڕووبارەکان.

کاتێك کۆچیان کرد، ڕۆمییەکان شارەکەیان، خاپوور کرد و دواتر گەڕانەوە و خەڵکەکەی لەسەرزەمینەکانی جەزیرە بلاّو بوونەوە. پاشای ڕۆم ڕۆشتە کالیکلا و لەمەرجی خەسی دابەزی و کوشانی ئەرمەنی ڕەوانە کرد و گەمارۆی خستەسەر. چەند برایەکی ئەرمەنی، لەخەڵکی شارەکە، کەلێنێکیان لەدیواری شارەکە دروست کرد. ئەوان دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت و پیاوەکانیان کوشت و ژنەکانیان، ئەسیر کرد. ئەو، (قایمی) بۆ لای پاشای ڕۆم، ڕەوانە کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا سەففاح، سلێمانی مامی وەك فەرمانداری بەسرە و گوندەکانی دەوروبەری و شارەکانی دیجلە و مێهر گەنگ دژ (جانقەزەق) دەستنیشان و فەرمانداری ئەهوازی بەمامەکەی دیکەی، یانی ئیسماعیل سپارد.

هەروەها لەم ساڵەدا داوود کوڕی عەلی، هەموو ئومەوییەکانی مەککە و مەدینەی کوشت. کاتێك مەبەستی کوشتاری ئەوانی کرد، عەبدوللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن پێی وت: براکەم، ئەگەر ئەوان بکوژیت، شانازی بەسەر چ کەسێکەوە دەکەیت کەپاشایەتیت لەدەست دەرهێنابێت؟ ئەمە بۆ تۆ بەس نییە کە لەبەیانییەوە تا ئێوارێ تۆ و شکۆ و مەزنی تۆ دەبینن کەئەوان ریسوا و سووك دەکەیت؟ بەڵام رازی نەبوو و هەموویانی کوشت.

لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاوەل/ ئۆکۆتبەری ٧٥٠ زایینی، داوود کوڕی عەلی لەمەدینە مرد و کاتێك سەردەمی مەرگی هات، کوڕەکەی، موسا کوڕی داوودی وەك جێگری خۆی دیاریکرد. کاتێك سەففاح لەمردنی ئەو ئاگادار بوویەوە، خاڵەکەی خۆی، زیاد کوڕی عەبدوللە کوڕی عەبدمەوانی وەك فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف دەستنیشان و محەممەد کوڕی یەزید کوڕی عەبدوللە کوڕی عەبدمەوانی وەك فەرمانداری یەمەن، رەوانە کرد. کاتێك زیاد هاتە مەدینە، ئیبراهیم کوڕی حەسانی سولەمی بۆ هێرش کردنە سەر یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە بۆ یەمامە رەوانە کرد کەخۆی و هاوەڵانی کوشت و لەناوی بردن.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەشعەس، بەرەو ئەفریقییە بەرێکەوت و شەڕی لەگەڵ خەڵکەکەی کرد و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. لەم ساڵەدا شەریك کوڕی شێخ مێهری، لەبووخارا، دژی ئەبوموسلیم راپەڕی و بۆ کارەکانی، سەرکۆنەی کرد و وتی: بۆ ئەوە شوێنکەوتنی بنەماڵەی محەممەدمان هەڵنەبژارد کەخوێنرێژی ببینین و کارەکان لەسەر بنەمای ناڕاستی بسوورێن. زیاتر لەسی هەزار کەس لەدەوری کۆبوونەوە. ئەبوموسلیم زیاد کوڕی ساڵحی خوزاعی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو نارد. زیاد، شەڕی لەگەڵ کرد و لەناوی برد.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیم رووی کردە خوتەل و دەستی بەسەردا گرت. پاشاکەی، حوبەیش کوڕی شەبل لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری نەکرد بەڵکو خۆی و گەورەکان، خۆیان داشارد. کاتێك باوکی داوود گوشاری خستەسەر، لەگەڵ کۆیلە و

نۆکەرەکانی هاتەدەر و بەرێکەوت تا گەیشتە سەرزەمینی فەرغانە. دواتر ڕۆشتنە ناو شارەکانی تورك و لەوێوە بۆ لای پاشای چین، ملی ڕێگەیان گرتەبەر. باوکی داوود، هەرکەسێکی توانی، ئەسیر و بۆ ئەبوموسلیمی نارد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی یەیزد کوڕی موهەلیب، لەموسڵ کوژرا. ئەو کەسەی پێیان دەوت سلێمان و بەئەسوەد ناسرا بوو، ئەمانی پێبەخشی و دواتر، کوشتی.

هەروەها لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی عەلی، سەعید کوڕی عەبدوڵڵەی بۆ شەڕی هاوینە ڕەوانە کرد تا لەولای دروب، شەڕی ئەزمون بکات.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی محەممەد فەرمانداری موسڵ لەسەر کار لابرا و لەجێگەی ئەو، ئیسماعیل کوڕی .عەلی هاتە سەرکار. لەبەر ئەوە یەحیایان لەسەر کار لابرد چوونکە کوشتاری بەکۆمەڵی لەموسڵ ئەنجامدا و کردەوە قێزەونەکانی بۆ هەمیشە وەك یادگار، مایەوە.

زیاد کوڕی عەبدوڵڵەی حارسی، ئاییني حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون جگە لەحیجاز و موسڵ و یەمەن کەئاماژەمان پێدان.

هەروەها لەم ساڵەدا ئێخشیدی فەرغانە لەگەڵ پاشای چاچ، ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر. ئێخشید داوای هاوکاری لەپاشای چین کرد و پاشای چین، سەد هەزار شەڕکەری بۆ نارد. گەمارۆیان خستە سەر پاشای چاچ و ئەو، لەسەر فەرمانی پاشای چین، خۆی تەسلیم کرد. بەلاّم زیانیان لەخۆی و کەسەکانی، نەدا. ئەم هەواڵە بە ئەبوموسلیم گەیشت و زیاد کوڕی ساڵحی بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد. لەکەنارەکانی ڕووباری تەراز، ڕووبەڕووی یەك بوونەوە و موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و نزیکەی پەنجا هەزار کەس، لەوانیان کوشت و بیست هەزار کەسیان ئەسیر کرد و کەسانی دیکە، هەڵاتن و ڕوویان کردە چین. ئەم ڕووداوە، لەزیحەجەی ١٣٣/ ژوئیەی ٧٥١ زایینی، ڕوویدا.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی ئەبی سەعید، کوڕی موعلی زورەقی ئەنساری و عەلی کوڕی بەزیمە موالی جابر کوڕی سەمورەی سوایی، ماڵئاواییان لەجیهان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و سیی و چوارەمی کۆچی (٧٥١- ٧٥٢ زایینی)

### شۆڕشی بەسام کوڕی ئیبراهیم

لەم ساڵەدا بەسام کوڕی ئیبراهیم کوڕی بەسام، سەرپێچی و نافەرمانی کردنی بنەماڵەی عەباسی ئاشکرا کرد. ئەو لەشەرکەرە بوێرەکانی خوراسان و یەکێك لەسوارکارە پاڵەوانەکانی ئەوان بوو. خۆی و دەستەیەك لەهاوەڵان و هاوڕێکانی بەنهێنی ڕۆشتنە مەداین. سەفاح، خازم کوڕی خەزیمەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد. هەردوولا بۆ شەڕ ڕیزیان بەست و سەرئەنجام، بەسام و شەڕکەرانی شکستیان خوارد و زۆربەیان کوژران. گەڕایەوە و لەزات مەتامیر تێپەڕی کەخاڵەکانی سەفاح، لەوێ دەژیان. ئەوان لەخەڵکانی عەبدمەدان و ژمارەیان دەگەیشتە سی و پێنج پیاو. هەژدە پیاوی دیکە و حەفدە کەس لەموالییەکانیان، لەگەڵ ئەواندا بوون (ژمارەیان بەگشتی حەفتا کەس بوو). سلاوی لەوان نەکرد. کاتێك لای ئەوان تێپەڕی، جوێنبارانیان کرد. پێشتریش ڕق و کینەی ئەوانی لەدڵدا بوو و ئەمە بەدوای چارەنووسی موغەیرە کوڕی فەزع و پەنا بردنی ئەو بۆ ئەمان بوو. موغەیرە یەکێك بوو لەهاوەڵانی بەسام. خازم گەڕایەوە و سەبارەت بەچارەنووسی موغەیرە پرسیاری لێکردن. وتیان: پیاوێکی نەناسراو هاوشێوەی ڕێبووار هاتە گوندەکەی ئێمە، شەوێك مایەوە و دواتر درێژەی بەڕێگەکەی خۆیدا. بەوانی وت: ئێوە خاڵەکانی سەروەری باوەڕدارانن، پیاوێك لەدوژمنەکانی دێتە گوندەکەی ئێوە و ئاسوودە لای ئێوە دەژیت! بۆ هێرشتان نەکردەسەر و دەستگیرتان نەکرد؟ بەشێوەیەکی ناشیرین وەلامیان دایەوە. خازم، فەرمانی کوشتنی هەموویانی دەرکرد و ماڵەکانی ئەوانی خاپوور و سامانی ئەوانی، بەتالان برد. دواتر درێژەی بەڕێگەکەی خۆیدا.

یەمانییەکان لەم کارە ئاگادار بوونەوە و زیاد کوڕی عەبدوڵلای حارسی ڕۆشتە لای سەفاح. پێیان وت: خازم بوێر بووە، تۆی ڕیسوا و خاڵەکانی تۆی کوشتووە. خاڵەکانت لەسەرزەمینە دوورەکانەوە هاتن و شارەکانیان بڕی و شانازیان بەتۆوە دەکرد تا لەبەخششەکانی تۆ کەڵك وەربگرن. سەرئەنجام لەپەنای تۆدا جێگیر بوون بەلام خازم

ئەوانی کوشت و ماڵەکانی وێران و سامانەکانی تالآن کردن بێ ئەوەی گوناحێکیان ئەنجام دابێت. سەففاح، بڕیاریدا خازم بکوژێت. موسا کوڕی کەعب و باوکی جەهم کوڕی عەتییە ئەمەیان بیست و ڕۆشتنە لای سەففاح و پێیان وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئێمە لەکردەوەی خەڵکان ئاگادارین وبیستوومانە دەتەوێت، خازم بکوژیت. پەنا دەبەین بۆ خوا و داوا دەکەین ئەو کارە نەکەیت چوونکە ئەو فەرمانبەر و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆیە. قورسایی باری کەسێکی ئاوا، شیاوە شانی بخرێتەبەر. شوێنکەوتەکانی ئێوە لەخەڵکانی خوراسان، ئێوەیان پێش ماڵ و منداڵەکانی خۆیان خست و خراپەخوازان و نەیارانی ئێوەیان کوشت. تۆ شیاوترین کەس بۆ بەخشینی گوناحەکانی ئەوانیت. ئەگەر بڕیاری کوشتنی ئەوتداوە، دەستی خۆت بەخوێنی ئەو پیس مەکە بەڵکو بۆ کارێکی دژوار ڕەوانەی بکە چوونکە ئەگەر کوژرا بەمەبەستەکەت دەگەیت وئەگەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دەبێتە هۆی بەختەوەری تۆ.

ڕێگەیان بۆ دانا تا خازم بۆ شەڕی خەواریج ڕەوانە بکات کە لەعوممان و جەزیری کوڕی کاوان کۆبوونەوە و لەگەڵ شەیبان کوڕی عەبدعەزیزی یەشکری ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. سەففاح فەرمانیدا لەگەڵ حەوتسەد شەڕکەر، بەرێکەوێت. نامەی بۆ سلێمان کوڕی عەلی، فەرمانداری بەسرە نووسی تا ئەوان بۆ دوورگەی کوڕی کاوان و عوممان ڕەوانە بکات. خازم بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت.

## چارەنووسی خەواریج و کوژرانی شەیبان کوڕی عەبدعەزیز

خازم لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو بەسرە بەرێکەوت. لەناو خزم و کەسەکانی خۆی لەخەڵکانی مەروروود کەسانێکی هەڵبژاردبوو کەبەهێزی ئەوان، پشت ئەستوور و دڵگەرم بوو. کاتێك گەیشتە بەسرە، سلێمان ئەوانی سوار کەشتی و ژمارەیەك لەخەڵکانی تەمیمی، پەیوەستی ئەوان کرد. ئەوان لەدەریا درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا تا لەدوورگەی کوڕی کاوان، لەنگەریان گرت. خازم، فەزلە کوڕی نوعەیمی نەهشەلی لەگەڵ پێنسەد شەڕکەر بۆ شەڕی شەیبان ڕەوانە کرد. ئەوان، ڕووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. شەیبان و هاوەڵانی سوار کەشتی بوون و بەرەو عوممان بەرێکەوتن. هاوەڵانی ئەو، شوێنکەوتەی ئایینی سەفەرییەکان بوون. کاتێك گەیشتنە عوممان، جولەندی و

هاوەڵانی کە باوەڕیان بەئاینی ئەبازییەکان بوو، شەڕیان لەگەڵ ئەوان دەستپێکرد. شەڕەکە دژوار و شەیبان و هاوەڵانی کوشتار کران. لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٩/ ٧٤٧ زایینی، بەمشێوەیە، چۆنیەتی کوژرانی شەیبانمان، باس کرد.

خازم و هاوەڵانی ڕێگەی دەریایان گرتەبەر تا لەکەنارەکانی عوممان دابەزین. ڕێگەی بیابانیان گرتەبەر و لەگەڵ جولەندی و شەڕکەرەکانی، ڕووبەڕوو بوونەوە. ئەو ڕۆژە کوشتارێکی مەترسیدار کەوتە ناو شەڕکەرانی خازم و یەکێك لەبراکانی خۆی (لەدایکەوە) هاوڕێ لەگەڵ نەوەد کەس، کوژرا. بەیانی ئەو ڕۆژە، شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد و لەم کاتەدا نۆسەد کەس لەخەواریج کوژران و نزیکەی نەوەد کەسیان لەئاگردا سوتێنران. دوای حەوت ڕۆژ لەهاتنی خازم، بەپێی ئەندێشە و بۆچوونی یەکێك لەهاوەڵانی، شەڕیان دەستپێکرد و پەموویان کرد بەنووکی ڕمەکان و نەوتیان لێدا و بۆ ماڵەکانی جولەندی و شوێنکەوتکەکانی ئەویان، هاویشت. کاتێك ئەمەیان کرد و ماڵەکان، گڕیان گرت، جولەندی و هاوەڵانی سەرقاڵی دامرکاندنەوە و کوژاندنەوەی ئاگرەکە و ڕزگار کردنی ماڵ و منداڵ وسامانەکانی خۆیان بوون. لەم کاتەدا خازم و شەڕکەرانی هێرشیان کردە و شمشێریان خستە ناو ئەوان و جولەندی و شەڕکەرانی ئەویان کوشتار کرد بەشێوەیەك کەژمارەی کوژراوەکان لەو ڕۆژەدا بۆ دەهەزار کەس، بەرز بوویەوە. سەری ئەوانیان بۆ بەسرە ڕەوانە و سلێمان بۆ سەفاحی نارد. خازم بۆ ماوەی یەك مانگ لەوێ مایەوە و سەرئەنجام سەفاح بانگی کرد. خازم بەرێکەوت.

## شەڕی کەش

لەم ساڵەدا، باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیم، بۆ شەڕی خەڵکانی کەش بەرێکەوت و ئەخریدی پاشای کوشت هەرچەندە گوێرایەڵی فەرمانی عەباسییەکان بوو. هاوەڵانی ئەویشی کوشتار و دەفرە زێرینە گرانباییەکانی ئەوانی تالآن کرد کەبەشێوەی نیگاری چینییەکان ڕازێنرابوویەوە و هاوشێوەی ئەوەیان نەبینیبوو. هەروەها زینی فراوان و کالای چینی نایابیان تالآن کرد. خالید تالآنییەکانی بۆ سەمەرقەند بۆ لای ئەبوموسلیم ڕەوانە کرد. ئەو، دەستەیەك لەگەورەکانی ئەوانی کوشت بەلآم تارانی برای ئەخریدی بەزیندووی هێشتەوە وەك پاشای خەڵکەکەی، دەستنیشانی کرد. ئەبوموسلیم دوای

گوشتاری خەڵکانی سەغد و بووخارا، بۆ مەرو گەڕایەوە و فەرمانیدا دیواری شارەکە نۆژەن و دروست بکەنەوە. زیاد کوڕی ساڵحی وەك فەرمانداری ئەو شارە دەستنیشان و باوکی داوود بەرەو بەڵخ، بەرێکەوت.

## چارەنووسی مەنسور کوڕی جمهور

لەم ساڵەدا سەفاح، موسا کوڕی کەعبی بۆ سند و شەڕی مەنسور کوڕی جمهور، ڕەوانە کرد. بەرێکەوت و لەجێگەی خۆی موسەییب کوڕی زوهەیری وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی سەفاح، دەستنیشان کرد. موسا ڕۆشتە سند و ڕووبەرووی مەنسور بوویەوە کەدوانزە هەزار شەڕکەری لەگەڵدا بوو. مەنسور و سوپاکەی شکستیان خوارد و هەڵاتن و لەقوڵایی ریخەڵانەکان، لەتینویەتیدا مردن. دەستەیەك دەڵێن: گرفتاری ژانە سك بوو و لەئازارەکەی، مرد. جێگری مەنسور، لەهەڵاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە و ژنان وماڵ و منداڵ وسامانەکانی ئەوی هەڵگرت و ڕۆشتە سەرزەمینی خەزەرەکان.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێ

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یەزید کوڕی عەبدوڵلا، کارگوزاری یەمەن، مرد و مەنسور، لەجێگەی ئەو، عەلی کوڕی ڕەبیع کوڕی عەبدوڵلای دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا لەزی حەججە/ ژوئەنی ٧٥٢ زایینی، سەفاح لەحیرەوە ڕۆشتە ئەنبار. هەروەها لەم ساڵەدا ئەو، لەکوفەوە تا مەککە نیشانەکان و هێماکانی بۆ ڕێگاکان دانا.

عیسا کوڕی موسا، فەرمانداری کوفەئاییینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، کوڕی باوکی لەیلی، فەرمانداری مەدینە و مەککە و تایف و یەمامە، زیاد کوڕی عەبدوڵلا، فەرمانداری یەمەن، عەلی کوڕی ڕەبیعی حارسی، فەرمانداری بەسرە و شارەکانی و گوندەکانی عوممان و دیجلە، سلێمان کوڕی عەلی، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە، عیباد کوڕی مەنسور، فەرمانڕەوای سند، موسا کوڕی کەعب، فەرمانڕەوای خوراسان و کوێستان، ئەبوموسلیم، فەرمانداری فەلەستین، ساڵح کوڕی عەلی، فەرمانداری میسر، باوکی عەون، فەرمانداری موسڵ،

ئیسماعیل کوڕی عەلی، لەئەرمەنستان یەزید کوڕی ئەسید فەرمانڕەوایەتی دەکرد، لەئازەربایەجان محەممەد کوڕی سوڵ، سەرپەرەستی دیوانی خەراج، خالید کوڕی بەرمەك، فەرمانڕەوای جەزیرەن باوکی جەعفەری تاك دیناری، لەئازەربایەجان و ئەرەمەنستان، ئەو کەسەی ئاماژەمان پێدا و لەشام، عەبدوڵڵە کوڕی عەلی، فەرمانڕەوایەتی دەکرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و سەعد کوڕی عومەر کوڕی سولەیمی زورەقی، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد وسی وپێنجی کۆچی ( ( ٧٥٢- ٧٥٣ زایینی )

### شۆڕشی زیاد کوڕی ساڵح

لەم ساڵەدا، زیاد کوڕی ساڵح، لەپانتاییەکانی ماوەرائەلنەهر، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و سەرپێچی فەرمانەکانی کرد. ئەبوموسلیم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو، لەشاری مەرو، بەڕێکەوت. باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیم، نەسر کوڕی ڕاشدی بۆ تێرمێز نارد لەترسی ئەوەی نەکا زیاد کوڕی ساڵح، شەڕکەران بۆ گرتنی کەشتی و سامانەکانی ئەو دیارە، ڕەوانە بکات. نەسر ئەو کارەی کرد و مایەوە. کەسانێك لەخەڵکی تاڵەقان لەگەڵ پیاوێك بەناوی باوکی ئیسحاق ڕاپەڕین و نەسر کوڕی ڕاشدیان کوشت. کاتێك ئەم هەواڵە بەباوکی داوود گەیشت، عیسا کوڕی ماهانی بۆ گرتنی بکوژەکان ڕەوانە کرد. عیسا، بەدوایاندا گەڕا و ئەوانی کوشت.

ئەبوموسلیم بەخێرایی بەڕێکەوت تا گەیشتە ئامول و سیباع کوڕی نوعمانی ئەزدی، هاوڕێیەتی ئەوی دەکرد. سیباع، ئەو کەسە بوو سەففاح، ئەوی بۆ لای زیاد کوڕی ساڵح ڕەوانە و فەرمانی پێدابوو ئەگەر دەرفەتی پێویستی دەستکەوت، هێرش بکاتە سەر ئەبوموسلیم و خوێنی بڕێژێت.

ئەبوموسلیم لەم کارە ئاگادار بوویەوە و سیباعی لەئامول زیندانی کرد و خۆی بەرەو بووخارا کەوتە ڕێ. کاتێك لەو شارە دابەزی، ژمارەیەك لەفەرمانادەکانی سوپای زیاد کەرێگەی ناسازگاریان لەگەڵ ئەو گرتبووەبەر، هاتنە لای ئەبوموسلیم و ئاگاداریان کردەوە سیباع کوڕی نوعمان زیادی بۆ ئەم کارە هانداوە. ئەبوموسلیم فەرمانی بۆ کاروگوزارەکەی لەئامول نووسی تا سیبعان بکوژێت. کاتێك فەرماندەکانی زیاد پەیوەستی ئەبوموسلیم بوون، پەنای بۆ فەرمانداری گوندێك برد کەئەوی کوشت و سەری ئەوی تەسلیم بە ئەبوموسلیم کرد.

باوکی داوود بۆ لێپرسینەوە لەکارەکانی خەڵکی تاڵەقان چاوەڕێی کرد. ئەبوموسلیم نامەی بۆ نووسی و ئەوی لەکوژرانی زیاد ئاگادار کردەوە. ئەو ڕۆشتە کەش و عیسا کوڕی ماهانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بەسام کوڕی ئیبراهیم نارد و سوپایەکی بۆ ساعەر،

بەرێخست. خەڵکەکەی خوازیاری ئاشتی بوون کەپێیان بەخشرا.

بەسام، عیسا نەیتوانی لەبەرابەر ئەو هیچ کارێك بکات. عیسا نامەی بۆ کامیل کوڕی موزەفەر، هاورێی نزیکی ئەبوموسلیم، نووسی و سەرکۆنەی باوکی داوودی و بەپێشداوەری و سەختگیری نەزانانە، تۆمەتباری کرد. ئەبوموسلیم نامەکانی بۆ باوکی داوود نارد وبۆی نووسی: ئەم پیاوە گەردن درێژە کەوەك یەکێك لەهاوەڵە نزیکەکانی خۆت هەڵبژاردووە، بزانە سەبارەت بەتۆ چی دەڵێت. باوکی داوود نامەی بۆ عیسا نووسی و ئەوی بانگ کردەوە. کاتێك گەیشت، ئەوی خستە زیندان و دووری خستەوە. سوپاییەکان هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. ئەبوموسلیم بۆ مەرو، گەڕایەوە.

## شەڕ لەدوورگەی سیسیل

لەمساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی حەبیب، لەدوورگەی سیسیل شەڕی کرد و تاڵانی و ئەسیری دەستکەوت. پێشتر لەتێلمسان شەڕی کردبوو. کارگوزارانی ئەفریقییە گرفتاری ئاژاوەی بەربەرەکان بوون و سیسیل ئاسوودە و ڕۆمییەکان دووبارە نۆژەنیان کردەوە و قەڵاو دیوارەکانیان دروست کرد و ساڵانە کەشتییە شەڕکەرەکانیان دەنارد کە لەکەنارەکانی دوورگەکە دەسووڕانەوە و پارێزگاریان لێدەکرد.

هەندێ کات هێرشیان دەکردە سەر بازرگانە موسوڵمانەکان و تاڵانیان دەکردن.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، سلێمان کوڕی عەلی، فەرمانداری بەسرە و ناوچەکانی دەوروبەری، ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزاران هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: باوکی خازمی (شەل) ئەعرەج کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٤٠/ ٧٥٧ یا ١٤٤/ ٧٦١ زایینی، مرد. عەتا کوڕی عەبدوڵڵە موالی موتەلیب یا موهەلیب کەدەستەیەك دەڵێن: ئەو عەتا کوڕی مەیسەرە بەنازناوی باوکی عوسمانی خوراسانی بوو وئەگەری هەیە لەساڵی ١٣٤/ ٧٥٢ زایینی مردبێت. یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عەباس لەپارس کەفەرمانداری پارس وپێشتر فەرمانداری موسڵ بوو، سور کوڕی زەیدی دوئەلی، باوکی زەید موالی عەبدوڵڵە کوڕی عەیاش کوڕی ئەبی ڕەبیعەی مەخزومی کە یەکێك بوو لەپاڵەوانەکان.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەدو سی و شەشی کۆچی ((٧٥٣- ٧٥٤ زایینی))

### حەج کردنی ئەبوو جەعفەر و ئەبوموسلیم

لەم ساڵەدا ئەبوموسلیم نامەی بۆ سەفاح نووسی و داوای کرد مۆڵەتی پێبدات تا سەردانی بکات و دواتر بەمەبەستی حەج، بەرەو مەککە بەرێکەوێت. لەو کاتەوەی دەستی بەسەر خوراساندا گرتبوو، تا ئێستا، ئەو سەرزەمینەی بەجێنەهێشتبوو. سەفاح نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ پێنسەد کەس لەشەڕکەران بەرێکەوێت. ئەبوموسلیم نامەی بۆ نووسی: من کەسانێکی زۆرم داغدار کردووە و لەگیانی خۆم ئاسوودە نیم. سەفاح بۆی نووسی: لەگەڵ هەزار شەڕکەر بەرێکەوە چوونکە تۆ لەژێر فەرمانڕەوایی هاورێکانت و دەوڵەتەکەی خۆتدایت و ڕێگەی مەککە، پێویستی بەسوپای فراوان نییە.

ئەو لەگەڵ هەشت هەزار شەڕکەر بەرێکەوت و ئەوانی لەنەیشابوور تا ڕەی بڵاو کردەوە. سامان و گەنجەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و لەشاری ڕەی بەجێی هێشت. سامانی کوێستانەکانی کۆکردەوە و لەگەڵ هەزار شەڕکەر، بەرێکەوت. سەفاح فەرمانی بەفەرماندەکان و خەڵکانی دیکەدا، پێشوازی لێبکەن. ئەبوموسلیم ڕۆشتە لای سەفاح. سەفاح ئەوی بەگەورە ناو برد و ڕێزی گرت. دواتر داوای مۆڵەتی لەسەفاح کرد تا بۆ حەج بەرێکەوێت. سەفاح مۆڵەتی پێدا و وتی: ئەگەر ئەبووجەعفەری برام مەبەستی حەج کردنی نەبوو، سەرپەرەستی کردنی ئایینی حەجم بەتۆ دەسپارد. ئەوی لەنزیک خۆی دانیشاند.

ئەبووجەعفەر و ئەبوموسلیم، لەیەك ڕەنجا بوون. هۆکاری بێزاری ئەم دووانە لەیەکتر بەمشێوە بوو: کاتێك کاروبارەکان بۆ سەفاح ئارام و دەوڵەتەکەی سەقامگیر و ئاژاوەکان دامرکانەوە و کوشتاری بەکۆمەڵی دۆست و دوژمن کۆتایی پێهات، سەفاح، نامەی کارگوزاری ئەبوموسلیمی لەخوراسان بەمەنسوری برای، ڕەوانە کرد. لەنامەکەدا فەرمانی بە ئەبوموسلیم دەدا لەخەڵکانی خوراسان بۆ خۆی و دواتر بۆ مەنسوری برای بەیعەت وەربگرێت. ئەبوموسلیم و خەڵکانی خوراسان، لەگەڵ ئەم دووانە بەیعەتیان بەست بەڵام ئەبوموسلیم، مەنسوری ریسوا کرد. کاتێك ئەبووجەعفەر گەڕایەوە،

سەفاحی برای لەکردەوەکانی ئەبوموسلیم ئاگادار کردەوە. کاتێك ئەم جارەیان ئەبوموسلیم هات، ئەبووجەعفەر بەسەفاحی وت: گووێ لەوتەکانی من بگرە و ئەبوموسلیم بکوژە چوونکە سوێند بەخوا، مەبەستی خیانەتی هەیە. سەفاح وتی: تۆ باش دەزانیت کەچەند کار و شەڕی لەبەرژەوەندی ئێمەدا کردووە. ئەبووجەعفەر وتی: ئەوەی ئەنجامی داوە، بۆ دەوڵەتی کردووە، سوێند بەخوا ئەگەر پشیلەیەکت دەنارد، جێگەی ئەوی دەگرتەوە و پێگەی ئەوی بەدەست دەهێنا. سەفاح وتی: چۆن بیکوژین؟ ئەبووجەعفەر وتی: کاتێك دێتە لای تۆ و گفتوگۆ دەست پێدەکات، من لەپشتەوە بەخەنجەر لێی دەدەم و دەیکوژم. سەفاح وتی: چی لەهاوەڵانی ئەو بکەین؟ ئەبووجەعفەر وتی: ئەگەر بکوژرێت، ئەوان ریسوا دەبن و بڵاوەی لێدەکەن. سەفاح فەرمانی کوشتنی ئەوی پێدا وئەبووجەعفەر بەرێکەوت. سەفاح لەفەرمانەکەی پەشیمان بوویەوە و فەرمانی بەمەنسوردا، کارەکەی پشتگوێ بخات.

ئەبووجەعفەر پێشتر لەحەڕان بوو، دواتر ڕۆشتە ئەنبار کەسەفاح لەوێ بوو. لەحەڕان، موقاتیل کوری حەکیمی عەککی، وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

ئەبووجەعفەر و ئەبوموسلیم، حەجیان کرد. ئەبووجەعفەر، سەرپەرەستی ئاینی حەج کردن بوو.

لەم ساڵەدا زەید کوری ئەسلەم، کۆیلەی عومەر کوڕی خەتاب، مرد.

## مردنی سەفاح

لەم ساڵەدا (باوکی عەباس عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس) ناسراو بەناوی سەفاح لە ١٣ یا ١٢ زیحەجەجە/ ٩ یا ٨ ژوئەنی ٧٥٤ زایینی، مرد. نەخۆشی ئاوڵە ئەوی کوشت. ئەو رۆژەی مرد، ٣٢ یا ٣٦ یا ٢٨ ساڵ، تەمەنی بوو. فەرمانڕەوایی ئەو لەکاتی کوژرانی مەروان تا کاتی مەرگی خۆی، چوار ساڵ و لەکاتی بەیعەت وەرگرتن بۆ خەلافەت، چوارساڵ و هەشت مانگ یا چوار ساڵ و نۆ مانگ درێژەی کێشا.

پیاوێکی قژبژ بوو، ئەندامێکی بەرز، روخسارێکی سپی، لووتێکی درێژ و کونە لووتەکانی تەنگ، روخسار و ریشێکی جوان.

دایکی، ریتە کچی عوبەیداللە کوڕی عەبدوالله کوڕی عەبدمودانی حارسی بوو. وەزیرەکەی باوکی جەهم کوڕی عەتییە بوو.

عیسا کوڕی عەلی مامی، نوێژی لەسەر خوێند و لەئەنباری کۆن، بەخاکیان سپارد. لەو، نۆ عابا، چوار کراس، پێنج پانتۆڵ، چوار پێستە و سێ دەست جل و بەرگی گرانبایی خەز، بەجێما.

کوڕی نەفاح دوو بەیت هۆنراوەی هۆنییەوە و پیاوێکی بۆ لای سوپاکەی مەروان رەوانە کرد تا شەوانە بڕواتە ناو سوپاییەکان و خۆی دابشارێت و بەشێوەیەك نەیبینن، هاوار بکات:

| | |
|---|---|
| یا آل مروان ان الله مهلككم | و مبدل بكم خوفا و تشريدا |
| لا عمر الله من انشائكم احدا | و بثكم فى بلاد الخوف تطريدا |

یانی: ئەی بنەماڵەی مەروان، خوا لەناوبەری ئێوەیە کەلەجیاتی ئەم فەرمانڕەوایەتییە، ترس و ئاوارەییتان پێدەبەخشێت. خۆزگە هیچ کام لەئێوە رۆژگارێکی درێژ نەژین، خۆزگە خواوەند، ئێوە لەناو شارەکانی ترس و دەربەدەری نیشتەجێ بکات و پشتگوێتان بخات.

دەڵێت: ئەو کارەم کرد و دڵی ئەوانم، لێوانلێو کرد لەترس.

جەعفەر کوڕی یەحیا دەڵێت: رۆژێك سەفاح سەیری ئاوێنەی کرد (یەکێك بوو لەقۆزەکانی دنیا) و وتی: ئەی خوایە، ئەوە ناڵێم کەسلێمان کوڕی عەبدولمەلیك هێنایە سەرزمان کەمن پاشای قۆزی بەختەوەرم. بەردەوام دەڵێم: خوایە، رۆژگارێکی درێژم پێببەخشە و بارانی تەندروستی بەسەر مندا ببارێنە. لەم کاتەدا دەنگێك بەرز بوویەوە کە بەکۆیلەیەکی دیکەی دەوت: وادەی نێوان من و تۆ، دوو مانگ وپێنج رۆژ بێت. سەفاح ئەم وتارەی ئەوی بەخراپ لێکدایەوە و وتی: خوایە، بۆ من بەسە. هیچ هێزێك بەبێ هێزی خوا، بوونی نییە، کارەکانی خۆم بەتۆ سپارد و تەنیا، هاوکاریم لەتۆ دەوێت. چەند رۆژێك تێنەپەڕی کەگرفتاری (تا) بوو. نەخۆشییەکەی بەردەوام پەرەی دەسەند و لەکاتی دیاریکراو (دوو مانگ و پێنج رۆژ) کۆچی دوایی کرد.

## خەلافەتی مەنسور

لەم ساڵەدا سەفاح (عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس) فەرمانی خەلافەتی عەبدوالله کوڕی محەممەدی برای لەدوای خۆی نووسی و ئەوی کردە خەلیفەی موسوڵمانان. دوای ئەبووجەعفەر، عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی دیاری کرد. فەرمانەکەی پێچایەوە و مۆری و خۆی و مۆری کەسەکانی خۆی لێدا و بەدەستی عیسا کوڕی موسای، سپارد.

کاتێك سەفاح مرد، ئەبووجەعفەر لەمەککە بوو. عیسا کوڕی موسا نامەی بۆ ئەبووجەعفەر نووسی و لەمردنی سەفاح ئاگاداری کردەوە و پێی وت لەخەڵکان بەیعەتی وەرگرتووە. پەیك، لە(سەفییە) گەیشتە لای ئەبووجەعفەر. ئەبووجەعفەر وتی: صفت لنا ان شاء الله (بەخواستی خوا، فەرمانڕەوایی بۆ ئێمە دەستەبەر بوو) نامەی بۆ ئەبوموسلیم نووسی، و ئەوی بانگ کرد. ئەبووجەعفەر پێشتر گەڕابوویەوە. کاتێك دانیشت، نامەکەی بۆ هاویشت. ئەبوموسلیم نامەکەی خوێندەوە و خەمبار بوو، وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتووین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). ئەبوموسلیم سەیری ئەبووجەعفەری نەکرد چوونکە بەتەواوی ترسا بوو. وتی: فەرمانڕەوایەتیت گرتۆتە دەست، هۆکاری ئەم ترسەت، چییە؟ وتی: لەزیانی مامەکەم، عەبدوالله کوڕی عەلی دەترسم. ئەبوموسلیم وتی: مەترسە، بەخواستی خوا، زیانی ئەو، لەتۆ دووردەکەمەوە. زۆرینەی سوپاکەی ئەو لەخەڵکانی خوراسانن و نافەرمانی من ناکەن. ئەبووجەعفەر شادمان بوو. ئەبوموسلیم و هەموو خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد. ئەم دووانە ڕێگەی کوفەیان گرتەبەر.

دەستەیەك دەڵێن: ئەبوموسلیم ڕۆشتە لای ئەبووجەعفەر. ئەو پێشتر هەواڵەکەی بیست و نامەی بۆ ئەبووجەعفەر نووسی: خواوەند، تەمەنی درێژت پێببەخشێت و ئێمە لەتۆ، بەهرەمەند بکات. هەواڵێکی دڵتەزێنم بەدەست گەیشتوە کەهیچ هەواڵێك بەم ئەندازەیە خەمباری نەکردم. سەروەری باوەڕداران مردووە. داوا لەخوادەکەم، تەمەنی تۆ درێژ و بەختەوەری بەفەرمانڕەوایی تۆ ببەخشێت. لەناو کەسەکانت کەس بەئەندازەی من پارێزگاری لەتۆ ناکات و کەس بەئەندازەی من، هاودەنگی تۆ نییە، بەردەوام

دەمەوێت، شادمانیت پێشکەش بکەم. دواتر دوو رۆژ چاوەڕوان بوو و ئەوسا، بەیعەتی خۆی بۆنووسی. مەبەستی لەم چاوەڕوانییە، ترساندنی، ئەبووجەعفەر بوو.

دەڵێت: ئەبووجەعفەر، زیاد کوڕی عەبدوڵلای بۆ مەککە گەڕاندەوە. ئەو کارگوزاری سەفاح لەمەککە و مەدینە بوو. دەستەیەك دەڵێن: پێش مەرگ، ئەوی لەفەرمانداری ئەودوو شارە لابرد و کارگوزاری بەعەباس کوڕی عەبدوڵلا کوڕی مەعبەد کوڕی عەباس، سپارد.

کاتێك عیسا کوڕی موسا بەیعەتی لەخەڵکان بۆ ئەبووجەعفەر وەرگرت، کەسی بۆ لای عەبدوڵلا کوڕی عەلی لەشام ڕەوانە کرد و لەمەرگی سەفاح ئاگاداری کردەوە و پێی ڕاگەیاند کەخەڵکان لەگەڵ مەنسور بەیعەتیان کردووە، فەرمانی پێدا بەیعەت بۆ مەنسور وەربگرێت. عەبدوڵلا پێشتر ڕۆشتبووە لای سەفاح و ئەوی بۆ کاروباری شەڕی هاوینە ڕاسپارد و خەڵکانی شام و خوراسانی پەیوەستی سوپاکەی کرد. عەبدوڵلا بەرێکەوت تا گەیشتە دولوك. هێشتا نەگەیشتبوو هەواڵی مەرگی سەفاحی بیست. لەگەڵ سوپا و هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە و بەیعەتی بۆ مەنسور وەرگرت.

## ئاژاوە لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا حوباب کوڕی رواحە کوڕی عەبدوڵلای زوهری لەئاندۆلۆس، ئالای ئاژاوە و شۆڕشی بەرز کردووە و پێشنیاری فەرمانبەری کردنی خۆی، بەخەڵکاندا. دەستەیەك لەخەڵکانی یەمەن، لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو هێرشی کردە سەر سومەیل (فەرمانداری قەرتەبە) و گەمارۆی خستەسەر و گرفتاری کرد. سومەیل لەیوسفی فێهری فەرمانداری ئاندۆلۆس، داوای هاوکاری کرد بەڵام فێهری نەیتوانی کارێك بکات لەبەر ئەوەی وشکەساڵی و قاتوقڕی خەڵکی ئاندۆلۆسی ناتەوان کردبوو و لەلایەکی دیکە، یوسف سومەیلی بەدوژمنی خۆی دەزانی و خوازیاری لەناوچوون و کوژرانی ئەو بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا عامری عەبدەری شۆڕشی دەستپێکرد و دەستەیەکی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و لەگەڵ حوباب، دژی سومەیل، پەیمانی بەست. ئەم دووانە، پێشنیاری فەرمانبەری کردنی بەنی عەباسییان بەخەڵکان دەکرد.

کاتێك بازنەی گەمارۆکە، بەتەواوی گوشاری خستە سەر سومەیل، نامەی بۆ

خەڵکەکەی خۆی نووسی و داوای هاوکاری لەوان کرد. ئەوان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا، هاوکاری بکەن. کاتێك حوباب، لەنزیك بوونەوەی ئەوان ئاگادار بوویەوە، سومەیل لەشاری ساراگوسا هاتەدەر و حوباب، رووی کردە شارەکە و دەستی بەسەردا گرت و یوسفی فێهری، سومەیلی وەك فەرمانداری تەلیتەڵە دەستنیشان کرد.

## بیرکردنەوەی چەند، رووداوێك

کارگوزاری شام عەبدوڵڵە کوڕی عەلی، کوفە، عیسا کوڕی موسا، میسر، ساڵح کوڕی عەلی، بەسرە، سلێمان کوڕی عەلی، مەدینە، زیاد کوڕی عەبدوڵڵەی حارسی و مەککە، عەباس کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی مەعبەد بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: رەبیعە کوڕی ئەبی عەبدولرەحمان کەپێیان دەوت: رەبیعەی رەی و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٥ یا ١٤٢/ ٧٥٢ یا ٧٥٩ زایینی، مرد. عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی بەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم، عەبدولەلیك کوڕی عومەیر کوڕی سوەیدی لەخمی فەرەسی، لەبەر ئەوەی بەفەرەسی ناویان دەبرد چوونکە فەرەسی، ئەسپێکی رەسەنە. باوکی زەید عەتا کوڕی سایبی سەقەفی.

هەروەها لەم ساڵەدا، خەلیفە، ئەبووجەعفەر، مەنسور، لەمەککەوە هاتە کوفە و نوێژی هەینی لەگەڵ خەڵکان خوێند. وتارێکی پێشکەش بەوان کرد و بەرەو ئەنبار بەڕێکەوت و لەوێ مایەوە. دەستی بەسەر هەموو ناوچە و داراییەکاندا گرت. عیسا کوڕی موسا، گەنجینە و دیوانەکانی لەدەستا بوو. کاتێك مەنسور گەیشت، ئەوانی تەسلیم کرد و کارەکانی بەو سپارد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەدو سی وحەوتی کۆچی (( ٧٥٤- ٧٥٥ زایینی )

### شۆڕشی عەبدوالله کوڕی عەلی و شکستی ئەو

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەعەبدوالله کوڕی عەلی بەمەبەستی شەڕی هاوینە، لەگەڵ سوپایەك بەرێکەوت. سەفاح مرد و عیسا کوڕی موسا نامەی بۆ مامی، عەبدوالله کوڕی عەلی نووسی و ئەوی لەمەرگی سفاح ئاگادار کردەوە و فەرمانی پێدا، بۆ ئەبووجەعفەر، مەنسور، بەیعەت وەربگرێت چوونکە سەفاح پێش مەرگی خۆی، ئەوی وەك خەلیفە دەستنیشان کردبوو.

نێردراو، بەم فەرمانە، لەدولوك چاوی بەعەبدوالله کوڕی عەلی کەوت. عەبدوالله فەرمانیدا تا جارچییەك جاربدا: نوێژی گشتییەً خەڵك کۆبوونەوە و نامەی مەرگی سوفاحی بۆ خوێندنەوە و داوای لێکردن بەیعەت لەگەڵ ئەبووجەعفەر ببەستن. ئەوانی ئاگادار کردەوە کە: کاتێك سەفاح مەبەستی ئەوەی کرد سوپاییەکان بۆ شەڕی مەروان کوڕی محەممەد ڕەوانە بکات، کوڕەکانی باوکی بانگ کرد و داوای لێکردن، هەنگاو بەرنە پێش. وتی: هەرکەس لەناو ئێوە، خۆی بۆ ئەم کارە تەرخان بکات، دوای من خەلافەت دەگرێتەدەست. جگە لەمن کەس، هەنگاوی نەبردە پێش. بەم پێیە، بەرێکەوتن و بۆ بەهێز کردنی دەوڵەتەکەی، خوێنم ڕشت و کەسانێکی زۆرم کوشتار کرد. باوکی غانمی تایی و خوفاف مەرورووذی و کەسانی دیکە، شایەتیان بۆ راستی قسەکانیدا و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد. لەناو ئەوان حومەید کوڕی قوحتەبە و خەڵکانی دیکە لەخوراسان و شام و جەزیرە بوون بەلام حومەید، لێی جیابوویەوە.

دواتر عەبدوالله بەرێکەوت تا لەحەڕان دابەزی کەموقاتیلی عەککی لەوێ بوو. ئەبووجەعفەر لەکاتی بەرێکەوتن بۆ مەککە، ئەوی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. موقاتیل لەبەرابەر ئەو، سەنگەری گرت. عەبدوالله بۆ ماوەی چل ڕۆژ گەمارۆی خستەسەر.

ئەبوموسلیم لەگەڵ مەنسور لەحەج گەڕابوویەوە. بەمەنسوری وت: ئەگەر بخوازێت، خزمەتی تۆ دەکەم و ئەگەر بخوازیت، دەڕۆمە خوراسان و سوپاییەکان بۆ شەڕی تۆ،

ڕەوانە دەکەم و ئەگەر بخوازێت، شەڕی لەگەڵ عەبدوالله کوڕی عەلی دەکەم. مەنسور فەرمانی پێدا لەگەڵ شەڕکەران، بۆ شەڕی عەبدوالله کوڕی عەلی بەڕێکەوێت. هەموو شەڕکەران، هاوڕێیەتی ئەبوموسلیمیان کرد و کەس خۆی نەدزییەوە. حومەید کوڕی قوحتەبەیش کەپێشتر پەیوەستی ببوو، لەگەڵ ئەو بەڕێکەوت. فەرماندەیی پێشەنگەکانی بەمالك کوڕی هەیسەم، سپارد.

کاتێك عەبدوالله ئاگادار بوویەوە (ئەو گەمارۆی خستبووە سەر حەڕان) ئەبوموسلیم، بەمەبەستی شەڕکردن بەڕێکەوتووە، لەوە ترسا کەعەتای عەتکی، لەڕووبەڕوو، هێرش بکاتە سەری. لەگەڵ هاوەڵانی خۆی دابەزی و چەند ڕۆژێك مایەوە. دواتر ئەوی بۆلای عوسمان کوڕی عەبدعەلی کوڕی سوراقەی ئەزدی، ڕەوانە کرد. دوو کوڕەکەی هاوڕێیەتیان دەکرد. نامەیەکی بەودا نارد.

کاتێك، گەیشتنە لای عوسمان، عەتکی نامەکەی پێدا. ئەو، عەتکی کوشت و دوو کوڕەکەی خستە زیندانەوە. کاتێك عەبدوالله شکستی خوارد، هەر دووکیانی سەربڕی.

عەبدوالله کوڕی عەلی ترسا، خوراسانییەکان تا کۆتایی لەگەڵ ئەودا نەبن لەبەر ئەمە حەفدە هەزار کەس لەوانی کوشت و حومەید کوڕی قوحتەبەی وەك فەرمانڕەوای حەلەب، دەستنیشان کرد. بەودا، نامەیەکی بۆ کارگوزارەکەی، زوفەر کوڕی عاسم نووسی و فەرمانی پێدا کاتێك حومەید دەگاتە لای، خوێنی بڕێژێت. حومەید، بەنامەکەوە بەڕێکەوت. لەڕێگەدا بەخۆی وت: ڕۆشتن بەنامەیەك کەنازانم چی تیا نووسرا، کارێکی ڕاست نییە. نامەکەی خوێندەوە و کاتێك لەناوەڕۆکەکەی ئاگادار بوویەوە، کەسانی نزیکی خۆی لەنووسراوی ناو نامەکە ئاگادار کردەوە و وتی: هەرکەس دەیەوێت لەگەڵ من بێت، خۆی بۆ ڕۆشتن ئامادە بکات. کەسانێکی زۆر شوێنی کەوتن. حومەید لەڕێگەی روسافەوە بەرەو عێراق بەڕێکەوێت.

مەنسور، فەرمانی بەمحەممەد کوڕی سولدا بڕواتە لای عەبدوالله کوڕی عەلی و فریوی بدات بەڵکو بتوانێت خوێنی بڕێژێت. کاتێك ڕۆشتە لای، پێی وت: لەباوکی عەباسم بیست کەدەیوت: دوای من، عەبدوالڵەی مامم، خەلیفەیە. عەبدوالله وتی: درۆت کرد، ئەبووجەعفەر تۆی بۆ کوشتنی من ناردوە، فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

محەممەد کوڕی سول، باوەگەوڕێی ئیبراهیم، عەباسی سولی، دەبیر و نوسەر، بوو.

عەبدواللە کوڕی عەلی بەرێکەوت و لەشاری نەسیبین، خۆی بۆ شەڕ ئامادە و لەدەوری شارەکە، سەنگەری هەڵکەند. ئەبوموسلیم لەگەڵ سوپاکەی خۆی گەیشت. مەنسور بۆ حەسەن کوڕی قەحتەبە (جێگری خۆی لەئەرمەنستان) نامەی نووسی و فەرمانی پێدا، پەیوەستی ئەبوموسلیم، ببێت. ئەو، لەموسڵ، خۆی بە ئەبوموسلیم، گەیاند. ئەبوموسلیم بەرێکەوت و لەپانتاییەکانی نەسیبین دابەزی و رێگەی شامی گرتەبەر بەلآم مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ عەبدواللەی نەکرد و بۆی نووسی: فەرمانی شەڕ کردنی تۆم پێنەدراوە، سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم بڕۆمە شام وکاروبارەکانی ئەو ناوچە، سامان بدەم. کەسانێك لەخەڵکانی شام کەهاورێیەتی عەبدواللەیان دەکرد، پێیان وت: ئەم پیاوە بەرەو شارەکانی ئێمە دەڕوات تا خەڵکەکەی کوشتار و ژنان و منالآن ئەسیر بکات، چۆن دەتوانین لای تۆ بمێنینەوە؟ بەرەو سەرزەمینەکەی خۆمان دەڕۆین تا پارێزگاری لێبکەین. عەبدواللە بەوانی وت: ئەو مەبەستی ڕۆشتن بۆ شامی نییە بەڵکو تەنیا مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئێوەیە و ئەگەر بمێننەوە، بێ گومان، هێرش دەکاتە سەرتان. ئەوان رازی نەبوون و بەرەو شام بەرێکەوتن. ئەبوموسلیم لەنزیك ئەوان بوو. عەبدواللە بەرەو شام بەرێکەوت و ئەبوموسلیم، پێگە و جێگەی خۆی بەهێز و سەرچاوە و کانیاوەکانی دەوروبەری خۆی، کوێر و بەلاشەی مردووەکان، پیسی کرد.

عەبدواللە لەم کارە ئاگادار بوویەوە. وتی: مەگەر پێم نەوتن؟ ئەو گەڕایەوە و لەلەشکرگەکەی پێشووی ئەبوموسلیم دابەزی. بۆ ماوەی پێنج مانگ شەڕیان کرد. خەڵکانی شام کەرەستەی شەڕی زیاتریان لەبەر دەستا بوو. فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی عەبدواللە، بەکار کوڕی سولەمی عەقیلی، باڵی چەپ، حەبیب سومیدی ئەسەدی، فەرماندەی سوارکاران، عەبدولسەمەد کوڕی عەلی برای عەبدواللە کوڕی عەلی بوو. فەرماندەی باڵی راستی سوپاکەی ئەبوموسلیم، حەسەن کوڕی قەحتەبە و باڵی چەپ لەئەستۆی خازم کوڕی خەزیمەدا بوو.

شەڕکەرانی عەبدواللە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی ئەبوموسلیم و پاشەکشێیان پێکردن و گەڕانەوە. عەبدولسەمەد کوڕی عەلی لەگەڵ سوارکارانی خۆی، هێرشیان کردنەسەر و هەشت کەس لەوانیان کوشت و گەڕانەوە. دواتر کۆبوونەوە و بۆ جاری

دووەم هێرشیان کرد، ریزەکانی ئەوانیان بڕی و لەشوێنی خۆیان، هەڵیانکەندن. بە ئەبوموسلیم وترا: باشترە سوار لەسەر ئەسپ بڕۆیتە سەرئەو تەپۆڵکەیە تا خەڵکان بتبینن و بگەڕێنەوە چوونکە زۆربەیان هەڵاتوون. ئەبوموسلیم وتی: کەسانی بیرمەند لەمکاتەدان ئەسپی خۆیان بەم لاولادا نابەن. فەرمانی بەجارچییەکدا تا جاڕ بدات: ئەی خەڵکانی خوراسان، بگەڕێنەوە چوونکە سەرکەوتن تایبەت بەخۆپارێزانە. خەڵك، گەڕانەوە. ئەبوموسلیم لەو رۆژەدا ئەشیدی شەڕی خوێند و وتی:

من كان ينوى اهله فلا رجع فر من الموت و فى الموت وقع

یانی: هەرکەس مەبەستی بنەماڵە و ماڵی خۆی هەبێت، نەگەڕێتەوە، لەمەرگ رادەکات بەلاّم دەکەوێتە قوڕگی مەرگەوە.

تەختەیەك و سایەوانێکیان بۆ ئەبوموسلیم دروست کردبوو. کاتێك خەڵکان شەڕیان دەستپێکرد، ڕۆشتە سەر تەختەکە و سەیری گۆڕەپانی شەڕی کرد، ئەگەر کەلێن یا شکستی سوپاکەی خۆی دەبینی، ڕێگەی چارەی بۆ دەدۆزییەوە و فەرماندەیی ئەو ناوچەی بۆ پاراستنی شوێنەکەی، فەرمان دەدا و پێی دەوێت دەبێت چی بکات. نێردراوانی ئەو بەردەوام هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی خەڵکان دەستە دەستە گەڕانەوە.

کاتێك رۆژی سێشەممە یا چوارشەممە، حەوت رۆژی یەکەمی جەمادی الپانی ساڵی ١٣٦/ ٨ دێسامبەری ٧٥٣ زایینی، داهات، هەردوو لای شەڕکەر ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. ئەبوموسلیم پشتی بەفرت و فێڵ بەست و فەرمانی بەحەسەن کوڕی قەحتەبەدا باڵی ڕاست چۆڵ و زۆرینەی شەڕکەرانی پەیوەستی باڵی چەپ، بکات. تەنیا شەڕکەرە بوێرەکان لەشوێنەکانی خۆیان بهێڵێتەوە. کاتێك سوپاکەی شام ئەمەیان بینی، باڵی چەپی خۆیان چۆڵ کرد و هێرشیان کردە سەر باڵی ڕاستی سوپاکەی ئەبوموسلیم. ئەبوموسلیم فەرمانی بەشەڕکەرە بەئەزمونەکانی دڵی سوپاکەیدا، هاورێ لەگەڵ پاشماوەکانی باڵی راست، هێرش بکەنە سەر باڵی چەپی سوپاکەی دوژمن. شەڕکەران، هێرشیان برد و ئەبوموسلیم، سەرکەوتنی بەدەست هێنا وسوپاکەی عەبدواللە، شکستیان خوارد و هەڵاتن. عەبدواللە کوڕی عەلی بەسوراقەی ئەزدی وت: ئەی کوڕی سوراقە، چی دەبینیت؟ وتی: ئەوەی کەخۆڕاگری بکەیت تا دەکوژرێیت چوونکە هەڵاتن بۆ تۆ کارێکی قێزەون و نەشیاوە لەبەر ئەوەی کاتی خۆی، مەروانت بۆ هەڵاتن، سەرکۆنە کرد. وتی: بۆ

عێراق دەڕۆم. کوڕی سوراقە وتی: لەگەڵت دێم. ئەوان شکستیان خوارد و هەڵاتن و لەشکرگەکەی خۆیان بەجێهێشت. ئەبوموسلیم، لەشکرگەکەی گرت و مەنسوری ئاگادار کردەوە. ئەو، کۆیلەکەی خۆی، خەسیبی، ڕەوانە کرد تا سامانە تالآن کراوەکان بخەمڵێنێت و کۆیان بکاتەوە. ئەبوموسلیم، لەم کارە تووڕە بوو.

عەبدوڵلە کوڕی عەلی و عەبدسەمەد کوڕی عەلی بەڕێکەوتن، عەبدسەمەد بەرەو کوفە ڕۆشت و عیسا کوڕی موسا، نێوەنجیگەری کرد و ئەمانی لەمەنسور بۆ وەرگرت. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو عەبدسەمەد کوڕی عەلی لەروسافەی کوفە مایەوە تا جمهور کوڕی مەراری عیجلی لەگەڵ سوارەکانی مەنسور گەیشتە ئەو ناوچەیە. جمهوری ئەوی گرت و بەندی کرد و هاوڕێ لەگەڵ ئەبوو خەسیب بۆ لای مەنسوری نارد. مەنسور، ئەوی ئازاد کرد. عەبدوڵلە کوڕی عەلی ڕۆشتە لای سلێمان کوڕی عەلی برای لەبەسرە و ڕۆژگارێك، هاوشێوەی ئاوارەکان، لەو شارە مایەوە.

دوای شکست، ئەبوموسلیم ئەمانی بەخەڵکان بەخشی و فەرمانی بەشەڕکەرانیدا دەست لەکوشتاری خەڵکان هەڵبگرن.

## کوژرانی ئەبوموسلیمی خوراسانی

لەم ساڵەدا، ئەبوموسلیمی خوراسانی کوژرا. مەنسور، ئەوی کوشت.

چۆنیەتیەکەی ئەوەی کە ئەبوموسلیم نامەی بۆ سەففاح نووسی و داوای مۆڵەتی لێکرد تا حەج بکات (پێشتر ئاماژەمان پێدا). سەففاح نامەی بۆ مەنسور نووسی کەفەرمانڕەوای ئەرمەنستان و ئازەربایەجان و جەیزیرە بوو، وتی: ئەبوموسلیم نامەی بۆ نووسیوم و داوای مۆڵەتی کردووە تا حەج بکات، منیش، مۆڵەتی ئەو کارەم پێدا. ئەو دەیەوێت سەرپەرەستی ئایینی حەج کردن بەو بسپێرم. تۆیش نامە بنووسە و داوام لێبکە چوونکە ئەگەر تۆ لەمەککە بیت، تەماحی ئەوەی نابێت کەپێش تۆ بکەوێت.

مەنسور نامەی بۆ سەففاحی برای نووسی و داوای لێکرد مۆڵەتی بدات بۆ ئەوەی ئایینی حەج بەئەنجام بگەیەنێت. سەففاح مۆڵەتی پێدا و مەنسور بەرەو ئەنبار بەڕێکەوت. ئەبوموسلیم وتی: ئایا ئەبووجەعفەر ساڵێکی دیکەی دەستنەکەوت، حەج بکات؟ بەمشێوەیە، ڕقی ئەوی لەدڵ گرت. هەردووکیان پێکەوە حەجیان کرد.

ئەبوموسلیم، جلوبەرگی بەعەرەبە بیابان نشینەکان دەبەخشی و ڕێگەکانی تەخت و خۆش دەکرد و چاڵەکانی هەڵدەکەند و پاکی دەکردنەوە. هەمووان بەچاکە ناوی ئەویان دەهێنایە سەرزمان. بیابان نشینەکان دەیانوت: ئەمە ئەو کەسەیە درۆیان بۆ هەڵبەستووە. کاتێك گەیشتە مەککە و خەڵکانی یەمانی بینی، وتی: سوپایەکی زۆر باشن ئەگەر کەسێکی نەرم و نیان فەرماندەیی ئەوان بگرێتەدەست.

کاتێك خەڵکان لەشوێنی حەج کردنەوە بەرێکەوتن، ئەبوموسلیم لەرێگەدا پێش ئەبووجەعفەر کەوت. هەواڵی مەرگی سەفاحی پێگەیشت. نامەی بۆ ئەبووجەعفەر نووسی و بۆ مەرگی براکەی، دڵنەوایی کرد بەڵام بۆ بوونی بەخەلیفە، پیرۆزبایی لێنەکرد. نەگەڕایەوە بۆ ئەوەی چاوی بەمەنسور بکەوێت بەڵکو ویستی مەنسور بڕواتە لای. ئەبووجەعفەر تووڕە بوو و نامەیەکی توندی بۆ نووسی. کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت، وەڵامی دایەوە و پیرۆزبایی لێکرد. ئەبوموسلیم پێشیکەوت و گەیشتە ئەنبار و عیسا کوڕی موسای بانگ کرد تا بەیعەتی لەگەڵ ببەستێت. ئەو، ڕۆشتە لای عیسا. ئەبووجەعفەر گەیشتە ئەنبار و عەبدوالله کوڕی عەلی شۆڕشی دەستپێکرد. ئەبووجەعفەر، ئەبوموسلیمی بۆ شەڕی ئەو، ڕەوانە کرد. (باسمان کرد) حەسەن کوڕی قەحتەبەی پەیوەستی ئەبوموسلیم کرد. حەسەن بۆ ئەییووبی وەزیری مەنسور نامەی نووسی: ئەبوموسلیمم بینی کەنامەی سەروەری باوەڕدارانی بەدەست دەگات و دەیخوێنێتەوە و دواتر بۆ مالك کوڕی هەیسەمی دەهاوێت، ئەویش دەیخوێنێتەوە و هەردووکیان گاڵتە بەسەروەری باوەڕداران دەکەن و پێدەکەنن. کاتێك نامەکەی بەدەستی باوکی ئەییووب گەیشت، پێکەنی و وتی: زیاتر لەعەبدوالله کوڕی عەلی، گومانمان لە ئەبوموسلیم هەیە جگە لەوەی تەنیا هیوامان بەیەك شت هەیە کەخەڵکانی خوراسان، عەبدوواللەیان خۆشناوێت لەبەر ئەو کوشتارەی لەناو ئەوان خستییەگەڕ.

کاتێك عەبدوالله شکستی خوارد و ئەبوموسلیم سامانە تالآنکراوەکانی لەشکرگەکەی کۆکردەوە، مەنسور، کۆیلەکەی خۆی باوکی خەسیبی ڕەوانە کرد تاپێرستی تالآنییەکان تۆمار بکات. ئەبوموسلیم مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام نێوەنجیگەران لەمبارەوە گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و ئەویش، دەستی لەکوشتنی ئەو هەڵگرت، وتی: من، بۆ خوێنەکان ئەمینم بەڵام بۆ تالآنییەکان، خیانەتکار. باوکی خەسیب گەڕایەوە و مەنسوری لەکار و

کردەوەکانی ئەبوموسلیم، ئاگادار کردەوە. مەنسور ترسا ئەبوموسلیم بڕواتە خوراسان. نامەی بۆ نووسی: من تۆم وەك فەرمانڕەوای میسر و شام دەستنیشان کرد کە بۆتۆ، باشترە لەخوراسان، هەرکەسێك دەخوازێت، بۆ میسری ڕەوانە بکە و خۆت لەشام بمێنەرەوە تا لەنزیك سەروەری باوەڕداران بیت بۆ ئەوەی ئەگەر مەبەستی بینینی تۆی کرد، لەرێگەیەکی نزیکەوە، خۆت بگەیەنیت.

کاتێك نامەکەی مەنسوری بەدەست گەیشت، توڕە بوو، وتی: من دەکاتە فەرمانڕەوای میسر و شام و خوراسان لەدەستی من دەردێنێت! نێردراو ئەم هەواڵەی بەمەنسور گەیاند. ئەبوموسلیم لەجەزیرەوە بەرێکەوت و مەبەستی ئەوەی کرد رێگەی ناسازگاری لەگەڵ مەنسور بگرێتەبەر. ئەو شارەی بەجێهێشت و رووی کردە خوراسان.

مەنسور لەئەنبارەوە بەرەو مەداین ڕۆشت و نامەی بۆ ئەبوموسلیم نووسی و ئەوی بۆ لای خۆی، بانگ کرد. ئەبوموسلیم لەشاری زابەوە نامەی بۆ نووسی: هیچ دوژمنێك بۆ سەروەری باوەڕداران نەماوەتەوە و خواوەند، سەرکەوتنی پێبەخشیوە. ئێمە بەردەوام لەپاشاکانی ساسانی بیستوومانە کەمەترسیدارترین کات بۆ وەزیرەکان، ئەو کاتەیە که ئاژاوەکان دابمرکێنەوە. هەنووکە، ئێمە خۆمان لەتۆ بەدوور دەگرین و دەخوازین پێبەندی فەرمانەکانی تۆ بین و ئەمە تا ئەوکاتەیە کەتۆ پێبەندی بەڵێنەکانی خۆت بیت. دەخوازین گوێرایەڵ و بیسەر بین بەلام ئەمە تا کاتێك برەوی هەیە کەتەندروستی خۆمان نەکەوێتە مەترسییەوە. ئەگەر بەمە رازی دەبیت من هاوشێوەی باشترینی کۆیلەکانی تۆ دەبم و ئەگەر مەبەستی ئەوە بکەیت بێ چەند و چوون مەبەستەکانی دڵت بێنیتەدی، پەیمانەکەی خۆم دەشکێنم چوونکە تەندروستی خۆمم مەبەستە و دەمەوێت گیانی خۆم رزگار بکەم.

کاتێك نامەکەی بەدەستی مەنسور گەیشت، لەوەڵامدا بۆی نووسی: نامەکەی تۆم خوێندەوە و هەستم بەمەبەستەکەت کرد. نیشانەی تۆ نیشانەی ئەو وەزیرە خیانەتکارە لەبەرابەر پاشا ستەمکارەکەیان نییە کە لەتاو گوناحکاری و تاوانباری، شڵەژان و ئاژاوە دروست کردن لەناو دەوڵەتەکەی، لەسەردا پەروەردە دەکات چوونکە ئاسوودەی ئەوان بەندە بەئاسوودەی خەڵکان. بۆ خۆتت خستە ریزی ئەوان؟ تۆ بۆ گوێرایەڵی کردن و فەرمانبەری و رازی بوون بەهەموو ڕەنج و دژوارییەکانی ئەم دەوڵەتە، ئەو پێگەیەت

پێبڕاوە کەدەزانی. بەو مەرجەی باست کرد، فەرمانبەری و گوێڕایەڵی نامێنێت. عیسا کوڕی موسا نێردراوی سەروەری باوەڕداران پەیامێك بۆ تۆ دێنێت ئەگەر ملکەچ بوویت، ئارام دەگریت. لەخوام دەوێت تۆ لەشەیتان و بزوێنەرەکانی دوور بخاتەوە چوونکە ئەو هیچ دەرگایەکی بۆ بەفیڕۆدانی ئەندێشەی تۆ، بەنزیکتر نەبینیوە.

دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو ئەبوموسلیم نووسی: دوای سلاو، من پیاوێکم بۆ رێبەری و رێنیشاندانی خۆم هەڵبژارد و بەپێی مەرجە پێویستەکانی خوا لەسەر ئافرێنراوەکانی، کردەوەکانم ئەنجامدا. ئەو لەزانستەکان شارەزا و یەکێك بوو لەنزیکەکانی پێغەمبەر(د.خ)، منی بەکەسێکی ئاگا لەقورئان لەقەڵەمدا چوونکە فەرمانەکانی قورئانی گۆڕی و ئەم کارەی بۆ بەدەست هێنانی توێشویەکی کەمی ئەم دنیایە، کرد کەخواوەند بەندەکانی لەلەناوبردنی ئاگادار کردۆتەوە. ئەو، هاوشێوەی ئەو کەسە بوو لەچاڵی نەزانیدا خنکا. فەرمانی بەمندا شمشێر هەڵگرم و دڵسۆزی و میهرەبانی پشتگوێ بخەم و بەهیچ داوای لێخۆشبوونێك رازی نەبم و هەڵەکان، نەبەخشم. من ئەم کارانەم بۆ بۆ بەهێز کردن و سەقامگیری کردنی پاشایەتی نووسی تا خواوەند، ئەو کەسانە بەئێوە بناسێنێت کەرێزی ئێوەیان نەگرت و مافەکانی ئێوەیان پێشێل کرد. ئەگەر لەمن خۆش بێت، وەسف کراوە و ئەگەر سزام بدات، لەکار و کردەوە خراپەکانی خۆم، سەرچاوە دەگرێت. خواوەند ستەم لەبەندەکانی ناکات.

ئەبوموسلیم ناسازگار و نیگەران و توڕە بەرێکەوت و مەنسور رۆشتە مەداین. ئەبوموسلیم رێگەی حیلوانی گرتەبەر. مەنسور بەعیسا کوڕی عەلی مامی و ئامادەبووان لەهاشمییەکانی وت: نامە بۆ ئەبوموسلیم بنێرن. ئەوان دەستیان بەنامە ناردن کرد و ئەویان بەکەسێکی گەورە لەقەڵەمدا. سپاسیان کرد وداوایان لێکرد وەك هەمیشە فەرمانبرداری و گوێڕایەڵ بێت و رێز لەبەڵێن و پەیمانەکەی خۆی بگرێت، ئاگاداریان کردەوە تا بەجوانی بیر لەدەرئەنجامەکانی ستەمکاری و نافەرمانی بکاتەوە و فەرمانیان پێدا، سەردانی مەنسور بکات.

مەنسور، بەباوکی حومەیدی مەروزی نامەیەکی ڕەوانە کرد وپێی وت: بەنەرمترین شێوە، لەگەڵ ئەبوموسلیم بدوێ و بەخششەکانی ئێمەی یەکیەك بیربخەرەوە و پێی بڵێ پێگەی ئەو بەرز دەکەمەوە بەشێوەیەك کەهیچ کەس هاوشێوەی ئەو پێگەی پێ

نەبەخشیبێت. ئەگەر لەهاتن خۆی بەدوور گرت، پێی بڵێ: سەروەری باوەڕداران دەڵێت، لەنەژادی عەباس نیم و لەئایینی محەممەد بەدوورم کەئەگەر نافەرمان ڕەوانە ببیت، کاری تۆ بەکەس ناسپێرم و گەڕان و شەڕکردن لەگەڵ تۆ، دەگرمە ئەستۆ و کۆتایی پێدێنم، ئەگەر بڕۆیتە ناو دەریا، بەشوێنتا دێم و ئەگەر خۆت بخەیتە ناو ئاگر، بەدواتا دێم تا بتکوژم یا لەم ڕێگەدا، لەناوبچم. لەم وتەیە ئاگاداری نەکەیتەوە مەگەر ئەو کاتەی لەنەهاتنی، دڵنیا دەبیت.

باوکی حومەید بەڕێکەوت و لەحیلوان لای ئەبوموسلیم دابەزی. نامەکەی پێدا و پێی وت: خەڵك لەزمانی سەروەری باوەڕدارانەوە، هەندێ هەواڵ بەتۆ دەگەیێنن کەهیچ کات نەیهێناوەتە سەرزمان. ئەمەیش دەبێتە هۆی گۆڕانی بیروبۆچوونی تۆ. لەم ڕێگەوە ڕژدی و ستەمکاری دەکەنە پیشە و دەخوازن، کەڵك لەبەخششەکان وەربگرن. ئەوەی تا ئێستا ئەنجامتداوە، بەفیڕۆی مەدە. درێژەی بەقسەکانیدا و وتی: ئەی ئەبوموسلیم، تۆ وەك هەمیشە وەزیری بنەماڵەی محەممەد، ئەمینی بنەماڵەی محەممەدیت و خەڵك بەم تایبەتمەندییە تۆ دەناسن، پاداشتی خۆت لەبیرمەکە. ڕێگە بەشەیتان مەدە بەسەر تۆدا زاڵ بێت و گومڕات بکات.

ئەبوموسلیم وتی: لەکەیەوە بەمشێوەیە قسە لەگەڵ من دەکەیت؟ وتی: تۆ پێشنیاری ئەم کارەت پێکردین تا شوێن فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی محەممەد بکەوین و بەنی عەباس هەڵبژێرین. فەرمانت بەئێمەدا شەڕی نەیاران بکەین و لەشارە جۆراوجۆرەکان، بەهۆکاری جیاواز ئێمەت کۆکردەوە و خواوەند، بۆ ئەم کارە هانیدان و دڵی ئێمەی لەخۆشەویستی بنەماڵەی عەباس، لێوانێو کرد و بەهاوکاری کردنی ئەوان، ڕێزی گرتین. هیچ کام لەوانمان نەبینی مەگەر ئەوەی خۆشەویستی ئەو، لەدڵی ئێمەدا چرۆی کرد. گوێڕایەڵ و فەرمانبەر، ڕێگەی سەرزەمینی ئەوانمان گرتەبەر و سەرمان بەفەرمانەکانی ئەوان سپارد. ئایا ئێستا کەدوورترین مەبەستی خۆمان بەدەستهێناوە، دەتەوێت بارودۆخی ئێمە بشێوێنیت و دووبەرەکی لەناو وتارماندا، بەدیبێنیت؟ خۆت بەئێمەت وت: هەرکەس ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر، بیکوژن تەنانەت ئەگەر خۆیشم نافەرمانیم کرد، خوێنم برێژن.

ئەبوموسلیم ڕووی کردە باوکی نەسر، مالك کوڕی هەیسەم و وتی: مەگەر نابیستیت

ئەم پیاوە چی دەڵێت؟ ئەی مالك، هەرگیز بەم نەرم و نیانی قسەی نەکردووە. مالك پێی وت: گوێ لەوتەکانی مەگرە و چاوی لێبپۆشە! ئاگادار بە وتەکانی ئەو فریوت نەدات. سوێند بەگیانی خۆم، ئەم شێوازی قسە کردنی ئەو نییە و ئەوەی لەکۆتاییدا دەیبینیت، خراپتر لەمەیە. درێژە بەکارەکەی خۆت بدە و مەگەڕێرەوە چوونکە سوێند بەخوا ئەگەر بڕۆیتە لای مەنسور، خوێنت دەڕێژێت چوونکە گومانی لەدڵیدا دروست بووە و بەمشێوەیە، هیچ کات ناتوانێت بەئارامی و ئاسوودەیی، ژیان بەسەر ببات.

ئەبوموسلیم وتی: هەستن. هەستان. ئەبوموسلیم کەسی بۆ ری نەیزەك ڕەوانە کرد و نامەکانی بەو گەیاند و لەکاروبارەکان، ئاگاداری کردەوە. نەیزەك، پەیامی بۆ نارد: بەباشی نازانم، بڕۆیتە سەردانی، پێم باشە بڕۆیتە رەی و لەوێ بمێنیتەوە تا ئەوەی لەنێوان خوراسان و رەیدایە، لەژێر دەستی تۆ بێت. خەڵکەکەی، شەرکەرانی تۆن و سەرپێچی فەرمانەکانی تۆ ناکەن. ئەگەر سەبارەت بەتۆ راستی کردە پیشە، رێگەی سازگاری بگرەبەر و ئەگەر خراپەی کردە پیشە، لەناو شەڕکەرانی خۆتدا دەبیت و خوراسانییەکان پشتیوانی تۆ دەبن تا دواتر.

ئەبوموسلیم، باوکی حومەیدی بانگ کرد و پێی وت: بۆ لای سەرومرت بگەڕێرەوە و لەنەهاتنی من ئاگاداری بکەرەوە. وتی: مەبەستی ئەوەت کردووە رێگەی ناسازگاری بگریتەبەر؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەو کارە مەکە. وتی: هەرگیز پەشیمان نابمەوە. کاتێك لەنەڕۆشتنی ئەو دڵنیا بوو، وتە هەڕەشە ئامێزەکانی مەنسوری پێراگەیاند. ئەبوموسلیم سەری داخست و زەمانێکی درێژەی بەنیگەرانی وسەرگەردانی بەسەر برد، وتی: هەستە! وەك بڵێی ئەو قسانە وڕەی رووخاند و ترساندی.

مەنسور پێش ئەمە بۆ باوکی داوود، نوێنەری ئەبوموسلیم لەخوراسان، نامەی نووسیبوو و فەرمانی پێدابوو: تا ئەو کاتەی من زیندووم، تۆ فەرمانڕەوایەتی خوراسان دەکەیت. باوکی داوود نامەی بۆ ئەبوموسلیم نووسی: ئێمەیان بۆ نافەرمانی جێگرانی خواوەند و سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) نەئافراندوە. رێگەی ناسازگاری لەگەڵ سەرومری باوەڕداران مەگرەبەر. لەم کاتەدا، نامەی باوکی داوودیشی بەدەست گەیشت. ترس و دڵەراوکێی ئەبوموسلیم زیادی کردی و کەسی بۆ لای باوکی حومەید نارد و وتی: بەباشم زانی باوکی ئیسحاق بۆ لای سەرومری باوەڕداران

ڕەوانە بکەم تا بەتەواوی لەئەندێشە و بۆچوونی ئەو، ئاگادارم بکاتەوە چوونکە یەکێك لەوکەسانەی، پشتی پێدەبەستم. ئەبوموسلیم، ئەوی ڕەوانە کرد. هاشمییەکان بەباشترین شێوە پێشوازییان لێکرد. مەنسور پێی وت: ئەو لەمەبەستەکەی پەشیمان بکەرەوە تا فەرمانڕەوایەتی خوراسان بەتۆ ببەخشم. مەنسوری چەندین دیاری گرانبایی پێبەخشی.

باوکی ئیسحاق گەڕایەوە و بە ئەبوموسلیمی وت: هیچ دیاردەیەکی ناپەسەندم نەبینی. ئەوان باسی گەورەیی تۆ دەکەن و ڕێز لەمافی تۆ دەگرن و ئەومیان بۆ تۆ دەوێت کەبۆخۆیان، دەخوازن. پێشنیاری پێکرد بڕواتە لای سەروەری باوەڕداران و لەوەی ڕوویداوە، داوای لێخۆش بوون بکات. ئەبوموسلیم، بڕیاریدا بڕوات. نەیزەك پێی وت: بڕیاری خۆتت داوە؟ ئەبوموسلیم وتی: بەڵێ. ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

نا للرجال مع القضاء محالة ذهب القضاء بحيلة الاقوام

یانی: پیاوان، لەبەرابەر چارەنووس، ناتوان هیچ کارێك بکەن، هەمانا چارەنووسی، ڕێگەی چارەی خەڵکانی لەناو بردووە.

نەیزەك پێی وت: ئەگەر بڕیاری خۆتت داوە، خواوەند، بەهرەیەکی باشت پێببەخشێت. بەڵام یەك وتەی من لەگووێ بگرە: کاتێك ڕۆشتیتە لای، بیکوژە و دواتر لەگەڵ هەرکەسێك بەباشی دەزانی، بەیعەت بکە چوونکە خەڵکان نافەرمانی تۆ ناکەن.

ئەبوموسلیم نامەی بۆ مەنسور نووسی و لەهاتنی خۆی ئاگاداری کردەوە. بەرێکەوت و باوکی نەسر وەك فەرماندەی سوپاکەی دیاریکرد و پێی وت: بمێنەرەوە تا ئەو کاتەی نامەی من بەدەستت دەگات. ئەگەر نامەکە، نیوەی مۆری پێوە بوو، دڵنیابە خۆم نووسیومە و ئەگەر مۆری تەواوی پێوەبوو، هی من نییە. ئەبوموسلیم، لەگەڵ سێ هەزار پیاوی شەڕکەر، ڕۆشتە مەداین و خەڵکانی لەحیلوان بەجێهێشت.

کاتێك نامەکەی بەدەستی مەنسور گەیشت، خوێندییەوە و بۆ وەزیرەکەی خۆی، باوکی ئەییووبی، هاویشت و ئەویش خوێندییەوە. مەنسور وتی: سوێند بەخوا ئەگەر چاوم پێی بکەوێت، دەستبەجێ خوێنی دەڕێژم.

باوکی ئەییووب ترسا شەڕکەرانی ئەبوموسلیم مەنسور بکوژن و دواتر خۆی. لەبەر ئەمە سەلە کوڕی سەعید کوڕی جابری بانگ کرد و پێی وت: ئایا دەتەوێت سپاسگوزار بیت؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەگەر فەرمانداری ناوچەیەکت پێببەخشم بەئەندازەی

فەرمانداری عێراق، سامان و دارایيت دەستکەوێت، ئایا براکەت، حاتەم، دەکەیتە شەریك؟ ئایا نیوەی داهاتەکەی خۆت بەبراکەت دەبەخشیت؟ وتی: بەڵێ. وتی: کەسکەر لەیەکەم ساڵ، داهاتەکەی ئەوەندە بوو، ئەمساڵ چەند بەرابەرە، ئەگەر هاوشێوەی ئەمانەت یا بەپێی بەرهەمەکانی، ئەو سەرزەمینە بەتۆ بسپێرم، ئەوەندەی داهات بۆ تۆ هەیە کە لەکۆکردنەوەی بێزار دەبیت. وتی: چۆن دەتوانم ئەم سامانە بەدەست بێنم؟ باوکی ئەییووب وتی: بۆ لای ئەبوموسلیم بەرێکەوە وپێشوازی لێبکە و پێی بڵێ تا داوای ئەم سەرزەمینە لەسەروەری باوەڕداران بکات چوونکە سەروەری باوەڕداران دەیەوێت فەرمانڕەوایەتی ناوچەیەکی بەربلاوی پێببەخشێت وبەم شێوەیە، دڵخۆشی بکات. وتی: چۆن دەتوانم مۆڵەت لەسەروەری باوەڕداران وەربگرم بۆ ئەوەی بڕۆم؟ باوکی ئەییووب مۆڵەتی بۆ وەرگرت. مەنسور مۆڵەتی پێدا و پێی وت کاتێك ئەبوموسلیم دەبینێت، لەتامەزرۆیی ئەو بۆ بینینی ئەو، بدوێت. سەلە لەرێگە چاوی بە ئەبوموسلیم کەوت و لەهەواڵەکان ئاگاداری کردەوە. بەمشێوەیە ئەبوموسلیم ئارام بوویەوە چوونکە پێشتر بەردەوام لەدڵەراوکێ و ترسدا بوو. شادمان و خۆشحاڵ بوو تا ئەو کاتەی گەیشتە لای مەنسور.

کاتێك ئەبوموسلیم لێی نزیك کەوتەوە، فەرمانی بەخەڵکاندا بەگەرمترین شێوە پێشوازی لێبکەن. هاشمییەکان و خەڵکان پێشوازییان لێکرد. دواتر دابەزی و ڕۆشتە لای مەنسور و دەست وپێی ئەوی ماچ کرد. مەنسور پێی وت: بۆ ماڵەکەت بگەڕێرەوە و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ڕەنجی سەفەر لەجەستە دەربکە و دواتر برۆ بۆ گەرماو. ئەو، گەڕایەوە.

بۆ بەیانی، مەنسور، عوسمان کوڕی نەهیکی لەگەڵ چوارکەس لەپاسەوانەکانی خۆی بانگ کرد، شەبیب کوڕی واج و باوکی حەنیفە، حەرب کوڕی قەیس لەناو ئەواندا بوون. فەرمانی پیدان کاتێك دەستم خستە سەریەك، وەرنە ناو و خوێنی ئەبوموسلیم، برێژن. ئەوانی لەپشت پەردەکانەوە، شاردەوە.

کەسی بۆ لای ئەبوموسلیم نارد و بانگی کرد. عیسا کوڕی موسا لای ئەو بوو و نانی نیمەڕۆی دەخوارد. ئەبوموسلیم، ڕۆشتە لای مەنسور. مەنسور پێی وت: لەو دوو تیرەی لەگەڵ عەبدوللە کوڕی عەلی دۆزیتەوە، ئاگادارم بکەرەوە، چیت لێکردن. وتی: ئەمە یەکێکیان. وتی: نیشانم بدە. ئەبوموسلیم دەستی بردە ناو قۆڵی کراسەکەی و دەریهێنا.

مەنسوری لێی وەرگرت و خستە ژێر تەختەکەی. رووی تێکرد و بەردەوام سەرکۆنەی دەکرد، وتی: سەبارەت بەنامەکەت بۆ سەفاح ئاگادارم بکەرەوە بۆچی نووسیت هێرش نەکاتە سەر زەوی مردووەکان، دەتویست، زانستی دینمان فێر بکەیت؟ وتی: گومانم کرد کەگرتنی ئەو سەرزەمینانە ڕەوا نییە بەڵام کاتێك نامەکەی ئەوم بەدەست گەیشت، زانیم خۆی و بنەماڵەکەی، سەرچاوەی زانست و زانیارین. وتی: پێم بڵێ بۆ لەرێگەی مەککە پێش من کەوتیتەوە. وتی: کۆبوونەوەی هەردووکمان لەسەر ئاوەکە پەسەند نەکرد و ترسام زیان لەخەڵکان بدات، لەبەر خۆشویستنی خەڵك و ڕێز گرتن لەئاسایشی تۆ، پێش کەوتم. وتی: لێداونەکانت بۆ ئەو کەسانەی پێشنیاریان بەتۆ کرد لەرێگەی مەککە بۆ لای ئێمە بگەرێیتەوە ئەو کاتەی لەهەواڵی مەرگی سەفاح ئاگادار بوویتەوە، نەگەڕایتەوە تا لەئەندێشەی ئێمە ئاگادار ببیت نە چاوەڕوانت کرد تا ئێمە بەتۆ دەگەین و درێژەت بەرێگەکەی خۆتدا. وتی: ئەوەی بووە رێگری مانەوە و گەڕانەوەم، ئاسوودەی خەڵکان بوو. وتم تۆ دەڕۆیتە کوفە و رووبەرووی هیچ ناسازگارییەك نابیتەوە. وتی: ئەی کەنیزەکەی عەبدوالله کەدەتویست بۆ خۆتی هەڵبگریت. وتی: مەبەستی هەلگرتنیم نەبوو لەوە ترسام لەناو بچێت لەبەر ئەمە خستمە ناو کەژاوەکە و بردمە ناو خێوەتەکەی خۆم وکەسم راسپارد تا پارێزگاری لێبکات. وتی: ئەی سەبارەت بەنافەرمانی و سەرپێچی کردنی فەرمانەکان و بەرێکەوتن بۆ خوراسان چی دەڵێیت؟ وتی: ترسام ڕقی منت لەدڵ گرتبێت، بەخۆمم وت دەڕۆمە خوراسان و بەنامە، داوای لێخۆشبوونی لێدەکەم. وتی: ئەی سامانەکانی خوراسان کەکۆت کردۆتەوە؟ وتی: بەسەر شەڕکەراندا دابەشم کرد تا هێزی پێ وەربگرن و دڵخۆشبن. وتی: مەگەر تۆ نەبوویت نامەت بۆ نووسیم و سەرەتا ناوی خۆتت نووسی و خوازبێنی پووری من، ئامینەت، کرد و وات نیشاندا کەکوڕی سەلیت کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسیت؟ ئەی بێ دایك، هەڵەیەکی گەورەت کرد.

دواتر وتی: سلێمان کوڕی کەسیر لەرێگەی بانگەوازەکەی ئێمە، گرفتاری ڕەنج و مەینەتی فراوان بوو، یەکێك بوو لەو کەسانەی پشتمان پێدەبەست و پێش تۆ، باوەڕی بەئێمە هێنا، بۆچی کوشتت؟ وتی: مەبەستی ناسازگاری کردنی بوو و پشتی کردەمن. کوشتم تا رێگەی نافەرمانی کردنی لێبگرم.

کاتێك سەرزەنشت و سەرکۆنە کردنی مەنسور درێژەی کێشا، ئەبوموسلیم وتی: بەو پێشینەی بۆ پشتیوانی کردنی ئێوە هەمە و ئەو هەموو ڕەنج و دوژارییەی لەم ڕێگادا کێشاومە، شیاو نییە بەمشێوەیە قسە لەگەڵ من بکەیت. مەنسور وتی: ئەی ناپاك زادە، سوێند بەخوا ئەگەر تەنانەت کەنیزێك لەجێگەی تۆ دەبوو، دەیتوانی بەم پێگەیە بگات. تۆ لەناو دەوڵەتەکەی ئێمە کارت دەکرد و بەمشێوەیە بەهێز و گەورە بوویت.

ئەبوموسلیم دەستی گرت و ماچی دەکرد و بەردەوام داوای بەخشینی دەکرد. مەنسور وتی: هیچ کارێکم هاوشێوەی کاری ئەمڕۆ نەبینیوە! سوێند بەخوا تەنیا ڕق و کینەی منت زیاد کرد. ئەبوموسلیم وتی: لەمانە خۆشبە چوونکە جگە لەخواوەند ترسم لەکەس نییە. مەنسور توڕە بوو، جوێنی پێدا و دەستی خستە سەریەك. پاسەوانەکان هاتنەدەر. عوسمان کوڕی نەهیك لێدا وبەندی شمشێرەکەی پچڕاند. ئەبوموسلیم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، من بۆ دوژمنەکانت بەزیندووی بهێڵەرەوە. مەنسور وتی: خوا بمکوژێت ئەگەر تۆ نەکوژم، کام دوژمنە، لەتۆ مەترسیدارترە؟ پاسەوانەکان بەشمشێر کەوتنە گیانی و ئەو، بەردەوام هاواری دەکرد: بمبەخشە! مەنسور وتی: ئەی زادەی ژنی بۆگەن، لەکام بەخشینە دەدەوێیت لەکاتێکدا شمشێرەکان لەت لەتیان کردوویت! ئەو، لەمانگی شەعبان، پێنج ڕۆژ بۆ کۆتایی هاتنی مانگەکە/ ١٢ فەوریەی ٧٥٥ زایینی، کوژرا. مەنسور وتی:

زعمت ان الدين لا يقتضى فاستوف بالكيل ابا مخزم

سقيت من كاس كنت تسقى بها امر فى الحلق من العلقم

یانی: گومانت کرد داوای قەرزەکەت لێ ناکەن، ئێستا ئەی باوکی مەخزەم، پێوانەیەك پڕکە و بیخۆرەوە! لەو پێکە دەرخواردی تۆیاندا کەخۆت دەرخواردی کەسانی دیکەت دەدا. بادەیەکی تاڵتر لەهەموو بادەکان.

ئەبوموسلیم لەشەڕەکانی خۆی نزیکەی شەشسەد هەزار کەسی بێ بەزەییانە کوشتار کردبوو.

کاتێك ئەبوموسلیم کوژرا، باوکی جەهم ڕۆشتە لای مەنسور و بینی ئەبوموسلیم، کوژراوە. وتی: ئایا خەڵکان دوور نەکەمەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمان بدە کاڵاکان لەدیوانێك بۆ دیوانێکی دیکە ببەن.

باوکی جەهم هاتەدەر و وتی: بگەڕێنەوە چوونکە سوپاسالار دەیەوێت ماوەیەك لای سەروەری باوەڕداران، بحەسێتەوە. وتەکانی ئەویان بەراست زانی و گەڕانەوە. مەنسور فەرمانیدا، خەلاتی بەم کەسانە بدەن: باوکی ئیسحاق سەد هەزار (!؟). عیسا کوڕی موسا دوای کوژرانی ئەبوموسلیم، ڕۆشتە لای مەنسور وپێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەبوموسلیم، لەکوێیە؟ وتی: لێرە بوو. عیسا وتی: تۆ چاکەخوازی و فەرمانبەری ئەوت بینی و لەئەندێشەی ئیبراهیمی ڕێبەر، سەبارەت بەو ئاگاداریت. مەنسور وتی: ئەی پیاوی گێژ، لەسەراسەری زەوی دوژمنێکم بەمەترسیدارتر لەو نەدەزانی.! لەوێ داپۆشراوە، بڕۆ سەیری بکە. عیسا وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتووین وبۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقرە/٢/١٥٦). عیسا بیری لەئەندێشەی دیکە کردبوویەوە. مەنسور وتی: خوا دڵت لەناو ببات، ئایا بەبوونی ئەبوموسلیم، فەرمانڕەوایەتی و کارێکی شیاو، بۆ ئێوە دەمایەوە.

مەنسور، جەعفەر کوڕی حەنزەلەی بانگ کرد. پێی وت: سەبارەت بە ئەبوموسلیم، چی دەڵێیت؟ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر یەك تاڵ مووت لەسەری دەرکێشاوە، بیکوژە و دووبارە بیکوژە. مەنسور وتی: خوا بەختەوەرت بکات! کاتێك جەعفەر کوڕی حەنزەلە لاشەی کوژراوی ئەبوموسلیم بینی، بەمەنسوری وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەمڕۆ بەسەرەتا دەسپێکی خەلافەتی خۆت بزانە.

مەنسور، باوکی ئیسحاقی بانگ کرد. کاتێك ڕۆشتە لای، پێی وت: تۆ ئەو کەسە بوویت لاسایی فریوەکانی دوژمنی خوات دەکردەوە؟ مەنسوریان ئاگادار کردبوویەوە کەئەو، پێشنیاری بەئەبوموسلیم کردووە بڕواتە خوراسان و نەڕواتە لای مەنسور. باوکی ئیسحاق کەمێك بێدەنگ بوو و سەیری چەپ وراستی خۆی دەکرد، لەوە دەترسا ئەبوموسلیم لەوێ بێت و وتەکانی ببیستێت. مەنسور پێی وت: چیت پێخۆشە بیڵێ، خواوەند ئەو ستەمکارەی لەناوبرد. فەرمانیدا تا جەستەی ئەبوموسلیمی نیشان بدەن. کاتێك ئەبوموسلیمی بینی، کەوتە سەرزەوی و کوڕنوشی بۆ خواوەند برد. دواتر سەری بەرز کردەوە و وتی: سپاس بۆ خوا کەئەمڕۆ بەهاوکاری تۆ، ئەمانی بەمن بەخشی. سوێند بەخوا تەنانەت یەك ڕۆژ لەو ئاسوودە نەبووم و یەك ڕۆژ لەو نەترساوم. هەر ڕۆژێك دەڕۆشتمە لای ئەبوموسلیم، ماڵئاوایی یەکجارەکەیم لەبنەماڵەکەی خۆم دەکرد. وسیەتم دەکرد و جل و بەرگی مەرگم دەپۆشی و بۆنی خۆشم لەجەستەم دەدا. ئەوسا

جلەکانی خۆی لابرد و مەنسور بینی کەلەژێر جلەکانییەوە، جل و بەرگی کەتانی پۆشیوە و بۆنی خۆشی لەسەر و روخساری خۆیداوە.

کاتێك ئەبووجەعفەر، کردەوە وکارەکانی ئەوی بینی، دڵی بۆی سووتا و پێی وت: شوێن خەلیفەکەت بکەوە و سپاسی خواوەند بەجێبێنە کەتۆی لەدەستی ئەو ستەمکارە رزگار کردووە. ئەم خەڵکە لەدەوری من بڵاوە پێبکە.

مەنسور لەلایەن ئەبوموسلیمەوە بۆ باوکی نەسر، مالك کوڕی هەیسەم نامەی نووسی تا سامان و دارایی و باروبنەی ئەبوموسلیم لەگەڵ خۆی بێنێت و بەرێکەوێت. بەمۆری ئەبوموسلیم نامەکەی مۆر کرد. مالك کوڕی هەیسەم کاتێك مۆری تەواوی لەسەر نامەکە، بینی زانی کەئەبوموسلیم نامەکەی نەنووسیوە. وتی: سەرئەنجام کاری خۆتان کرد! دواتر روویکردە هەمەدان و بەرەو خوراسان بەرێکەوت.

مەنسور نامەی بۆ باوکی نەسر نووسی و فەرمانڕەوایەتی شارەزووری پێسپارد. نامەی فەرمانداری هەمەدانی بۆ زوهەیر کوڕی تەرەکی نووسی. بۆئەوی نووسی کە لەهەمەدان بوو: کاتێك باوکی نەسر لای تۆ تێدەپەڕێت، زیندانی بکە. نامەکە زووتر بەزوهەیر گەیشت و باوکی نەسر لەهەمەدان بوو. زوهەیر وتی: خواردنێکم ئامادە کردووە، باشترە شەرەفێکم پێببەخشیت و بێیتە ماڵەکەی من. باوکی نەسر ڕۆشتە ماڵی زوهەیر. زوهەیر ئەوی گرت و زیندانی کرد. ئەبووجەعفەر نامەی بۆ زوهەیر نووسی و فەرمانی کوشتنی باوکی نەسری پێدا. نێردراو نامەی فەرمانڕەوایەتی شارەزووری بەباوکی نەسر گەیاند. زوهەیر کەئەوی خۆش دەویست، ئازادی کرد. باوکی نەسر ڕۆشتەدەر و بەرێکەوت و بەیانی ئەو رۆژە، نامەکەی مەنسور بەدەستی زوهەیر گەیشت کەفەرمانی کوشتنی باوکی نەسری پێدەدا. وتی: پێشتر فەرمانێك هات کەئەو فەرمانداری بێت و من، ئازادم کرد.

باوکی نەسر ڕۆشتە لای مەنسور. مەنسور پێی وت: پێشنیارت بەئەبوموسلیم کرد تا بڕواتە خوراسان؟ وتی: بەڵێ، چاکەی زۆری لەگەڵ کردبووم و منیش وەڵامی چاکییەکانی ئەوم دایەوە و دەمەویست چاکەخوازی ئەوبم. ئەگەر سەروەری باوەڕداران پەروەردەم بکات و فەرمانداریم پێببەخشێت، چاکەخوازی ئەو دەبەم و سپاسی دەکەم. مەنسوری ئەوی بەخشی.

کاتێك ڕۆژی ڕاوەندییان گەیشت، (مەبەستی ئەوەیان کرد بڕۆنە ناو کۆشکەکەی مەنسور و بیکوژن) باوکی نەسر لەبەر دەرگای کۆشکەکەی وەستا و وتی: ئەمڕۆ من دەرگاوانم، تا من زیندووم، کەس ناڕواتە ناو کۆشکەکە. مەنسور سەبارەت بەو پرسیاری کرد و لەکار و کردەوەکانی ئەو، ئاگاداریان کردەوە و زانی باوکی نەسر، چاکەخوازی ئەوە. دەستەیەك دەڵێن: زوهەیر، باوکی نەسری گرت و بۆ لای مەنسور، ڕەوانەی کرد. مەنسوری ئەوی بەخشی و وەك فەرمانداری موسڵ، دەستنیشانی کرد.

کاتێك مەنسور، ئەبوموسلیمی کوشت، وتارێکی پێشکەش بەخەڵکان کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، لەپانتاییەکانی فەرمانبەری، بەرەو دەشتی مەترسیداری نافەرمانی مەڕۆن و دوای ئەو هەولأنەی بۆ دەرەوشانەوەی ڕاستی و دروستی، داوتانە، بەرەو تاریکایی کەژی و چەوتی، هەنگاو مەنێن. ئەبوموسلیم بەراستی کارەکانی دەستپێکرد و بەچەوتی کۆتایی پێهێنا و بەناو و نیشانی ئێمە، دەستی بەسەر کەل و پەلی خەڵکان گرت و کەمێکی بۆ ئێمە ڕەوانە کرد. کردەوە قێزەونەکانی ناخی خۆی، خستە پێش جوانی ڕووکەشی. ئێمە لەپیسی و گلأوی سرشتی ئەو، شتی زۆرمان بینی ئەگەر سەرکۆنەکەرانی ئێمەدەیانزانی، بۆ کوشتنی ئەو، دەسخۆشیی و بۆ درەنگ کوشتنی ئەو، سەرکۆنەیان دەکردین. ئەو بەردەوام پەیمانەکانی خۆی دەشکاند و ڕێزی لەبەڵێنەکانی خۆی نەدەگرت تا ئەو ڕادەی سزادانی ئەو، بۆ ئێمە ڕەوا و ئێمە، بەراستی خوێنی ئەومان ڕشت. ئێمە سەبارەت بەو، ئەو فەرمانەمان دەرکرد کەئەو بەخەڵکانی دەدا (جگە لەخۆی. ئەو کەسەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکرد، سزای دەدا. مافێکی لەگەردنی ئێمەدا هەبوو، بەلأم نەبووە ڕێگری ئەوەی، فەرمانی دادپەروەری ئێمە، ئەویش بگرێتەوە. هۆنراوەیەکی پەسەندە ئەوەی نابغەی زەبیانی بۆ نەعمان، هێنایە سەرزمان:

فمن اطاعك فانفعه بطاعته  كما اطاعك و ادلله على الرشد

و من عصاك فعاقبه معاقبة  تنهى الظلوم و لا تقعد على ضمد

یانی: هەرکەس فەرمانبەری تۆ بکات، بۆ کردەوەکانی پارێزگاری لێبکە و سوودی پێبگەیێنە چوونکە ملکەچی فەرمانەکانی تۆ بوو و لەبەر ئەمە پێویستە، پاداشتی بدەیت لەبەر ئەوەی ڕێگەی ڕاستی هەڵبژاردوە. هەرکەس نافەرمانی تۆ بکات، بەشێوەیەك سزای بدە کەنافەرمانان وانەی لێوەربگرن، بەڵێ کینە و ڕق لەدڵ مەگرە (ڕق

و کینەی خۆت خاڵی و تەپ و تۆز لەخاکی دوژمنان بەرز بکەرەوە و ئەوان بەدارەکانەوە هەڵواسە.

دواتر لەسەر تەختی وتاردان هاتەخوار.

ئەبوموسلیم، حەدیسی پێغەمبەری لەعێکرەمە، باوکی زوبەیری مەککی، سابتی بوونانی، محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی و سەدیر، گێڕاوەتەوە و ئیبراهیم کوڕی مەیمونی سایغ و عەبدوالله کوڕی موبارەك، لەئەبوموسلیم، حەدیسیان گێڕاوەتەوە.

ڕۆژێکی وتارێکی پێشکەش کرد. پیاوێك سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەم جل و بەرگە ڕەشە چییە خۆتت پێداپۆشییوە؟ وتی: باوکی زوبەیر لەجابر کوڕی عەبدوالله حەدیسێکی بۆ گێڕامەوە کەپێغەمبەر(ص) لەڕۆژی گرتنی مەککە، دەستارێکی ڕەشی لەسەردا بوو، ئەم جل و بەرگە، شکۆ و گەورەیی فەرمانڕەوکانە. کۆیلەکەم، هەستە و خوێنی بڕێژە!

لەعەبدوالله کوڕی موبارەکیان پرسی: ئەبوموسلیم باشتر بوو یا حەجاج؟ وتی: ناڵێم ئەبوموسلیم باشتر لەهیچ کەسێك بوو بەڵام حەجاج لەو خراپتر بوو.

ئەبوموسلیمی خوراسانی پیاوێکی بوێر، بۆچوونێکی ئاسنین، فەرزان، بیرمەند، جوامێر و دوورئەندێش بوو. لێیان پرسی: ئەم پێگەیەت بەدەست هێناوە و بەئاسانی، دوژمنانت سەرکوت کردووە، چۆن توانیت ئەم کارە ئەنجام بدەیت؟ وتی: جل و بەرگی خۆڕاگریم پۆشی، ڕازدار بووم، خەمم لەخۆم دوور خستەوە، نیگەرانیم پشتگوێ خست، ڕووبەڕووی چارەنووسی بوومەوە و شەڕم لەگەڵ فەرمانە ئاسمانییەکان کرد. دواتر وتی:

قدنلت با الحزم و الکتمان ما عجزت — عنه ملوك بنی ساسان اذ حشدوا

ما زلت اضربهم بالسیف فانتبووها — من رقدة لم ینمها قبلهم احد

طفقت اسعی علیهم فی دیارهم — و القوم فی ملکهم بالسام قد رقدوا

و من رعی غنما فی الارض مسبعة — و نام عنها تولی رعیها الاسد

یانی: بەدوور ئەندێشی و نهێنی کاری، گەشتمە ئەو جێگەی کەپاشاکانی ساسانی هەموو هێزی خۆیان کۆکردەوە بەڵام نەیانتوانی بگەنە ئەم پێگەیە. بەردەوام بەشمشێر لەوانمدا و ئەوانن لەخەو بەئاگا هاتنەوە کەپێشتر کەس بەو قورسییە نەخەوتبوو. ڕووم

کردە سەرزەمیینەکانی ئەوان و یەك یەك سەرەزەمینەکانی ئەوانم بڕی و عەرەبەکان لەناو کۆشکەکانی خۆیان لەشام خەوتبوون. هەر کەس لەدیارێکی پڕ وەحشی، مەر بلەوڕێنێت، شێرژی ژیانی لەوەڕین لەو لەوەڕگەیە، بەکار دەبات.

دەڵێن: جارێك ئەبوموسلیم سوار کەرێکی بێ کورتان، بێ کەل و پەلی شەڕ، بێ نۆکەر و کۆیلە، ڕۆشتە نەیشابوور و بەرەو ماڵی فەرمانداره‌کەی بەرێکەوت و لەدەرگایدا. هاوەڵانی ترسان و بۆ لای ئەو هاتنەدەر. بەوانی وت: پێی بڵێن ئەبوموسلیم لەبەردەم ماڵەکەی تۆدایە و داوای هەزار درەم و چوارپێ دەکات. فەرمانداریان ئاگادار کردەوە. پرسی: چ جل و بەرگێکی لەبەردایە و چەند شەڕکەر و پاسەوانی لەگەڵدایە؟ وتیان: تەنیا و بێ هیچ پاسەوانێك هاتەوە و جلێکی ئەوتۆی لەبەردا نییە. فەرمانداری، بۆ ماوەی کاژێرێك سەری دانەواند و دواتر هەزار درەم و یەکێك لەباشترین ئەسپەکانی خۆی بۆ برد. وتی: ئەی ئەبوموسلیم، ئەوەی داوات کردبوو، پێشکەشم کردی، ئەگەر نیازێکی دیکەت هەیە، لەخزمەتتام. ئەبوموسلیم وتی: ئەوەی کردت، لەبیری ناکەم.

کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، یەکێك لەکەسانی نزیکی پێی وت: ئەگەر دەست بەسەر نەیشابووردا بگریت، تا ئەو جێگەی بخوازیت دەتوانی لەدارایی فەرماندارە ئاگرپەرستەکەی، بەدەست بێنیت. ئەبوموسلیم وتی: ئەو پێشتر چاکەی لەگەڵ ئێمە کردووە. کاتێك دەستی بەسەر نەیشابووردا گرت، فەرماندارەکەی چەندین دیاری گرانبایی بۆ نارد. ئەبوموسلیم دەستی بۆ سامان و دارایی فەرماندارەکە و کەسانی نزیکی ئەو، درێژ نەکرد. ئەمە، یەکێکە لەنیشانەکانی گەورەیی و جوامێری ئەو.

ڕووداوەکانی تر

لەم ساڵەدا، مەنسور، باوکی داوودی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کرد و فەرمانەکەی، نووسی.

## شۆڕشی سەنباد لەخوراسان

لەم ساڵەدا سەنباد لەخوراسان، بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی ئەبوموسلیم، شۆڕشی دەستپێکرد. ئەو ئاگرپەرەست و نیشتەجێی یەکێك لەگوندەکانی نەیشابوور بەناوی ئاهرەوانە بوو. شۆڕشی ئەو لەکوژرانی ئەبوموسلیم سەرچاوەی گرت چوونکە

ئەوی گەورە و پەروەردە کردبوو. شوێنکەوتەکانی فراوان بوون. زۆرینەی ئەوان لەخەڵکانی کوێستان و کێوەکان بوون. سەنباد، دەستی بەسەر نەیشابوور و قومس و رەیدا گرت و ناوی فیروزی سوپاسالاری لەخۆینا. کاتێك گەیشتە رەی، دەستی بەسەر گەنجینەکانی ئەبوموسلیم گرت. ئەبوموسلیم، لەکاتی بەرێکەوتن بۆ لای سەفاحی خوێنرێژ، سامان و داراییەکانی لەو شارە بەجێهێشتبوو. سەنباد ژنانی ئەسیر دەکرد و سامانەکانی تالآن دەکرد بەلآم بازرگانەکانی نەدەکوشت. وای نیشاندەدا مەبەستی حەج کردنی هەیە بەلآم دەیویست، وێرانی بکات.

مەنسور، جومهور کوڕی مەرای عیجلی لەگەڵ دەهەزار شەرکەر، بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو، رەوانە کرد. ئەوان لەنێوان هەمەدان و رەی، لەبیابان، رووبەرووی یەکبوونەوە. جومهور مەبەستی ئەوەی کرد درەنگتر شەڕ لەگەڵ ئەودا دەستپێبکات. کاتێك روبەرووی یەکبوونەو، سەنباد، ژنە ئەسیرە موسوڵمانەکان سوار وشتر کرد و پێش خۆی خست. ژنەکان، کاتێك سوپای موسوڵمانانیان بینی، لەکەژاوەکانەوە، هاواریان کرد: ئەی محەممەد! ئیسلام لەناوچوو! ڕەشەبا هەڵیکرد و وشترەکان رەمیان کرد و بۆ لای سوپاکەی سەنباد، گەڕانەوە. سوپاییەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان بەدوای وشترەکان، هێرشیان کردە سەریان و شمشێریان خستە ناو ئاگرپەرستەکان. تا ئەو جێگەی دەیانتوانی، شەرکەرانی سوپاکەی سەنبادیان کوشت. ژمارەی کوژراوەکان شەست هەزار کەس و ژنان و منالآنی ئەوان، ئەسیر کران. سەنباد لەشوێنێك لەنێوان تەبەرستان و قومس، کوژرا.

شۆڕشەکەی سەنباد، حەفتا رۆژ درێژەی کێشا. هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو کەئەو، مەبەستی تەبەرستانی و پەنای بۆ پاشاکەی برد. فەرمانڕەوای تەبەرستان یەکێك لەپیاوەکانی خۆی، (بەناوی توس)بۆ پێشوازی کردنی ئەو ڕەوانە کرد. سەنباد بەشێوەیەکی توند و تیژ و نەشیاو لەگەڵ کارگوزارەکەی پاشای تەبەرستان جووڵایەوە. توس، ئەوی کوشت و نامەی بۆ مەنسور نووسی و لەکوشتنی سەنباد، ئاگاداری کردەوە. مەنسور نامەی بۆ فەرمانداری تەبەرستان نووسی و داوای سامانەکانی کرد. وتی: هیچی لەدەستا نییە. مەنسور سوپایەکی کردەسەر. فەرمانڕەوای تەبەرستان، بۆ دەیلەم، هەڵات.

## شۆڕشی مولبەد کوڕی حەرمەلە

لەمساڵەدا، مولبەد کوڕی حەرمەلە، لەپانتاییەکانی جەزیرە، بەهەڵگرتنی دروشمی خەواریج، شۆڕشی دەستپێکرد. پاسەوانانی جەزیرە بۆ رووبەروو بوونەویان بەرێکەوت. ئەو نزیکەی سێ هەزار سوارکاری لەگەڵدا بوو. رووبەروویان بوونەوە و شکستیان پێهێنان و دەستیان بەکوشتاری ئەوان کرد. دواتر یەزید کوڕی حاتەمی موهەلبی بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت و مولبەد، ئەوی کوشت و کەنیزەکەی، ئەسیر کرد. مەنسور، کۆیلەکەی خۆی بەناوی موهەلهیل کوڕی سەفوانی لەگەڵ دوو هەزار شەڕکەر ڕەوانە کرد. مولبەد شکستی بەسوپاکەی هێنا و لەشکرگەکەی، تاڵان کرد.

دواتر نەزاری (یەکێك لەفەرماندەکانی سوپای خوراسانی) بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد. مولبەد توانی بیکوژێت و بلاوە بەسوپاکەی بکات.

دواتر زیاد کوڕی موشکانی بەسوپایەکی گەورە بۆ شەڕی ئەوان نارد مولبەد، توانی شکست بەوان بهێنێت. دووبارە مەنسور، ساڵح کوڕی سوبەیحی بەسوپایەکی گەورەوە ڕەوانە کرد. مولبەد رووبەروویان بوویەوە و شەڕی لەگەڵ کردن و شکستی پێهێنان. دواتر حومەید کوڕی قەحتەبە هێرشی کردە مولبەد و شکستی خوارد. حومەید ناچار بوو سەد هەزار درەم بەمولبەد بدات بۆ ئەوەی دەستی لێ هەڵبگرێت.

دەستەیەك دەڵێن: شۆڕشەکەی مولبەد لەساڵی ١٣٨/ ٧٥٥- ٧٥٦ زایینی روویدا.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا شەڕی هاوینە رووینەدا چوونکە گرفتاری شەڕ لەگەڵ سەنباد بوون.

ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، (فەرمانداری موسڵ) ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

فەرمانڕەوای مەدینە، زیاد کوڕی عەبدوالله، فەرمانڕەوای مەککە، عەباس کوڕی عەبدوالله کوڕی مەعبەد، کوفە، عیسا کوڕی موسا، بەسرە و شارەکانی، سلێمان کوڕی عەلی، سەرپەرەستی دامەزراوی دادی بەسرە، عومەر کوڕی عامری سولەمی، فەرمانڕەوای خوراسان، باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیم، فەرمانڕەوای میسر، ساڵح کوڕی عەلی، فەرمانڕەوای جەزیرە حومەید کوڕی قەحتەبە، فەرمانڕەوای موسڵ، ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله کوڕی عەلی کوڕی عەباس بوو.

عەباس کوڕی عەبدوالله کوڕی مەعبەد، لەکاتی ئەنجامدانی ئایینی حەج، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و سی و هەشتی کۆچی( ٧٥٥- ٧٥٦ زایینی )

### شۆڕشی جومهور کوڕی مەراری عیجلی

لەم ساڵەدا جومهور کوڕی مەراری عیجلی لەشاری ڕەی، سەرپێچی لەفەرمانەکانی مەنسور کرد.

چۆنیەتییەکەی: کاتێك جومهور شکستی بەسەنباد هێنا، ئەوەی تاڵانی لەلەشکرگەکەی سەنباد و خەزێنەکەی ئەبوموسلیم دەستی کەوت، هەڵیگرت و هیچی بۆ مەنسور نەنارد. لەمکارەی خۆی ترسا و ڕێگەی سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی مەنسوری گرتەبەر. مەنسور، محەممەد کوڕی ئەشعەسی لەگەڵ سوپایەکی گەورە، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو، ڕەوانەی شاری ڕەی کرد. جومهور لەم شارە ڕۆشتەدەر و بەرەو ئیسفەهان بەرێکەوت. محەممەد، سوپایەکی بۆ شەڕی ئەو نارد و خۆی لەشاری ڕەی مایەوە. جومهور دەستی بەسەر ئیسفەهاندا گرت. دەستەیەك لەهاوەڵانی جومهور پێشنیاریان پێکرد لەگەڵ شەڕکەرە بەهێزەکانی خۆی شەڕ لەگەڵ محەممەد بکات لەبەر ئەوەی سوپاکەی کەمە و ئەگەر بتوانێت شکستی پێبێنێت، کەسانێتر گرنگی ئەوتۆیان نابێت. جومهور، تێکۆشەرانە هێرشی کردە سەر محەممەد.

محەممەد ئاگادار بوویەوە و وشیاری کردە پیشە و دوورئەندێشی هەڵبژارد. سوپای هاوکاری لەخوراسانەوە پەیوەسیت محەممەد و بەمشێوەیە، بەهێز بوو. هەردوو سوپا لەکۆشکی فیروزان لەنێوان ڕەی و ئیسفەهان، ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و کوشتاری یەکیان دەستپێکرد. باشترین و بوێرترینی شەڕکەرانی ئێران لەناو سوپاکەی جومهوردا بوون. جومهور شکستی خوارد و دەستەیەکی فراوان لەسوپاکەی کوشتار کران. خۆی هەڵات و ڕوویکردە ئازەربایەجان. دواتر ئەو لەئیسپادوزا کوژرا. هاوەڵەکانی ئەویان کوشت و سەرەکەیان بۆ مەنسور ڕەوانە کرد.

## کوژرانی مولبەدی خەواریجی

لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵەکانی پێشوو، ئاماژەمان بەشۆڕشەکەی ئەودا و باسمان کرد کەحومەید کوڕی قەحتەبە، لەترسی ئەو سەنگەری گرت. کاتێك مەنسوریان لەهەواڵی سەرکەوتنەکانی مولبەد ئاگادار کردەوە و پێیان وت کەحومەید لەترسا سەنگەری گرتووە، عەبدعەزیز کوڕی عەبدولرەحمان برای عەبد جەبار و زیاد کوڕی موشکانی بۆ شەڕی ئەو، ڕەوانە کرد. مولبەد سەد سواری هەڵبژارد و لەسەرڕێگەی ئەوان، جێگیری کردن. کاتێك عەبدعەزیز ڕووبەرووی بوویەوە، ئەو کەسانەی بۆسەیان دانابوو، هاتنەدەر و شکستیان بەسوپاکەی هێنا و زۆربەی شەڕکەرانی کوژران.

مەنسور، خازم کوڕی خەزیمەی لەگەڵ هەشت هەزار شەڕکەر لەشەڕکەرانی مەرو ڕوود، بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد. خازم بەرێکەوت و لەموسڵ دابەزی و دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بۆ شەڕی مولبەد ڕەوانە کرد. مولبەد لەدیجلە تێپەڕی و ڕووی کردە بەلد و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خازم، ریزی بەست. خازم پێشڕەوی دەستپێکرد. فەرماندەی پێشەنگەکانی سوپاکەی فەزلە کوڕی نوعەیم کوڕی خەزیم کوڕی عەبدوڵلەی نەشهەلی بوو، فەرماندەیی باڵی ڕاست لەئەستۆی زوهەیر کوڕی محەممەدی عامری و باڵی چەپ لەژێر دەستی باوکی حیماد ئەبرەسدا بوو. خازم خۆی فەرماندەیی ناوەڕاستی سوپاکەی گرتەدەست. لەبەیانییەوە تا ئێوارێ بەشێوەیەکی ئەزۆر دژوار شەڕی لەگەڵ مولبەد و سوپاکەی کرد و هەردوولا ، لەکاتی شەو دەستیان لەشەڕ هەڵگرت. بۆ بەیانی، مولبەد بەرەو شاری حەزە بەرێکەوت و خازم و سوپاکەی شوێنی کەوتن تا شەو داهات. بەرەبەیان بۆ شەڕ ریزیان بەست. خازم هاتەدەر و ئەوان سەنگەرەکانی خۆیان بەجێهێشت. خازم بەچقڵی گەورە گەورە، سەنگەری خۆی و شەڕکەرەکانی داپۆشیبوو. کاتێك هاتنەدەر، مولبەد و سوپاکەی هێرشیان کردنەسەر. کاتێك خازم ئەمەی بینی، چقڵەکانی خستە بەرپێی ئەوان. ئەوان هێرشیان کردە سەر باڵی ڕاستی سوپاکەی خازم. دواتر هێرشیان کردە سەر باڵی چەپ و ریزەکانیان بڕی و لەناو هاوەڵانی هاواری کرد: لەسەر زەوی ڕاکشێن، لەسەر زەوی ڕاکشێن! دابەزین و مولبەد و سوپاکەی دابەزین و چوارپێکانی خۆیان کوشت. دواتر بەشمشێر کوشتاری یەکیان دەستپێکرد.

خازم فەرمانی بەفەزلە کوڕی نوعەیمدا، کاتێك تەپوتۆزی گۆڕەپان بۆ ئاسمان بەرزبوویەوە و ئێمە نەمانتوانی یەك ببین، سوار ئەسپەکانی خۆیان بن و بەزوبینەکان،

کوشتاریان بکەن. ئەو کارەی کرد و شەرکەرانی خازم لەراستەوە روویان کردە چەپ و شەرکەرانی مولبەد و خودی ئەویان تیرباران کرد. مولبەد و هەشسەد کەس لەشەرکەرانی کە لەئەسپ دابەزیبوون، کوژران و دوای هاتنەخوار لەئەسپ، نزیکەی سێسەد کەس لەوان لەناوچوون و شەرکەرانی دیکە هەلاتن. فەزلە شوێنیان کەوت و سەد و پەنجا کەسی دیکەی لەوان کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا کۆنستانتین پاشای رۆم هێرشی کردە سەر وڵاتە ئیسلامییەکان و رۆشتە ناو مەلتییە و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و دیوارەکەی رووخاند و ئەمانی بەشەرکەران و ژنان و منالانی ناو شارەکە بەخشی.

هەروەها لەم ساڵەدا، عەباس کوری محەممەد کوری عەلی هاورێ لەگەڵ سالح کوری عەلی و عیسا کوری عەلی، بۆ شەری هاوێنە بەرێکەوتن. دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٩/ ٧٥٦-٧٥٧ روویدا. سالح سەر لەنوێ دیواری شاری مەلتییەی نۆژەن کردەوە کەلەدەستی پاشای رۆم، وێران کرابوو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوری عەلی ( کە لەگەڵ براکەی سلێمان کوری عەلی لەبەسرە نیشتەجێ بوو) بۆ مەنسور بەیعەتی وەرگرت.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور مسجد الحرامی فراوان کرد.

ئایینی حەج لەم ساڵەدا فەزل کوری سالح کوری عەلی ئەنجامیدا.

فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف، زیاد کوری عەبدوڵڵەی حارسی بوو، فەرمانداری کوفە و سواد، عیسا کوری موسا، فەرمانداری بەسرە، سلێمان کوری عەلی، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە، سوار کوری عەبدوڵڵە، فەرمانداری خوراسان، باوکی داوود و فەرمانداری میسر، سالح کوری عەلی بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: سواد کوری ریفاعە کوری ئەبی مالکی قەرتەبی، سەعید کوری جومهان (باوکی حەفسی سولەمی) کە لەسەفینەوە حەدیسی (خەلافەتی سی ساڵ) دەگێرێتەوە. یوسن کوری عوبەیدی بەسرەی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٩/ ٧٥٦- ٧٥٧ زایینی مرد.

# ڕووداوەکانی ساڵی سەد و سی و نۆی کۆچی ( ٧٥٦- ٧٥٧ زایینی )

## شەڕ لەگەڵ ڕۆمییەکان

دانانی بەهای ئازادی ئەسیرەکان

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی عەلی و عەباس کوڕی محەممەد، لەنۆژەن کردنەوەی ئەوەی ڕۆمییەکان لەمەڵتییە وێرانیان کردبوو، تەواو بوون و دواتر بەمەبەستی شەڕی هاوینە ڕوویان کردە دەروازەی (حەدەس) و لەقوڵایی سەرزەمینی ڕۆم، پێشڕەویان کرد. ساڵح، دوو خوشکەکەی دایکی عیسا و لەبابە، کچەکانی عەلی هاوڕێیەتیان دەکرد. ئەم دووانە پەیمانیان لەگەڵ خوا بەستبوو ئەگەر فەرمانڕەوایەتی ئومەوییەکان، لەناو بچێت، لەڕێگەی خوادا شەڕ بکەن. جەعفەر کوڕی حەنزەلەی مێهرانی لەدەروازەی مەڵتییەوە بەمەبەستی شەڕ، پێشڕەوی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئاڵوگۆڕی بەهای ئازادی ئەسیرەکان لەنێوان مەنسور و پاشای ڕۆم ئەنجامدرا. مەنسور ئەسیرە موسڵمانەکانی کڕییەوە و ئەسیرەکانی ڕۆمی لەم سەرزەمینە، لەکالیکلیا و شوێنەکانیتر، گەڕاندەوە. سەرلەنوێ ئەو ناوچانەی ئاوەدان کردەوە و خەڵکە ڕەسنەکەی بۆ شوێنی خۆیان گەڕاندەوە و سوپایەکی لەخەڵکانی جەزیرە و سەرزەمینەکانیتر، بۆ ئەو ناوچانە ڕەوانە کرد کەلەوێ نیشتەجێ بوون و پاسەوانی کردنیان گرتە ئەستۆ.

کۆنستانتین پاشای ڕۆم لەگەڵ سەد هەزار شەڕکەر پێشڕەوی کرد تا گەیشتە جەیحان بەڵام کاتێك فراوانی ژمارەی سوپای موسوڵمانانی زانی، لەهێرش کردنە سەر ئەوان پەشیمان بوویەوە و تا ساڵی ١٤٦/ ٧٦٣ زایینی شەڕی ڕووینەدا لەبەر ئەوەی لەم ماوەدا مەنسور گرفتاری شەڕ لەگەڵ مناڵەکانی عەبدوللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی بوو: دەستەیەك وتوویانە: حەسەن کوڕی قەحتەبە لەساڵی ١٤٠/ ٧٥٧ – ٧٥٨ زایینی لەگەڵ عەبدولوەهاب کوڕی ئیبراهیم، بەمەبەستی شەڕی هاوینە، پێشڕەویان کرد.

## ڕۆشتنی عەبدولرەحمان کوڕی معاویە بۆ ئاندۆلۆس

لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٩٢/ ٧١٠-٧١١ زایینی باسمان کرد لەم ساڵەدا ئاندۆلۆس دەستی بەسەرداگیرا و موسا کوڕی نەسیر، لەفەرمانڕەوایەتی دوورخرایەوە.

کاتێك لەسەرکار لابرا و بەرەو شام بەڕێکەوت، کوڕەکەی عەبدعەزیزی وەك جێگری خۆی دەستنیشان و دەسەڵاتەکانی پێی بەخشی. عەبد عەزیز، توانی پارێزگاری لەسنوورەکان بکات. لەکاتی فەرمانڕەوایەتی ئەو، دەست بەسەر چەندین شاری دیکەدا گیرا. ئەو، پیاوێکی چاکەکار و بیرمەند و فرەزان بوو. تا ساڵی ٩٧/ ٧١٥ – ٧١٦ زایینی فەرمانڕەوایەتی لەدەستا بوو و لەهەمان ناوچە کوژرا کەپێشتر ئاماژەمان بەچۆنییەتی و هۆکارەکانی کوژرانی ئەودا.

کاتێك کوژرا، خەڵکانی ئاندۆلۆس بۆ ماوەی شەش مانگ، فەرمانڕەوایان نەبوو. دواتر لەسەر فەرمانڕەوایەتی ئەییووب کوڕی حەبیبی لەخمی (خوشکەزای موسا کوڕی نەسیر) ڕێککەوتن. ئەو پیاوێکی خواپەرەست و خۆپارێز بوو، پێشنوێژی بۆ ئەوان دەکرد. دواتر ڕوویکردە قەرتەبە و لەسەرتاکانی ساڵی ٩٨/ ٧١٦- ٧١٧ زایینی یا کۆتاییەکانی ٩٨/ ٧١٦ زایینی، ئەو شارەی کردە پایتەختی خۆی.

سلێمان کوڕی عەبدولمەلیك دوای ئەو، حوڕ کوڕی عەبدولرەحمانی سەقەفی وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچە دەستنیشان و ڕەوانە کرد. حوڕ، لەساڵی ٩٨/ ٧١٦- ٧١٧ زایینی، گەیشتە ئەو سەرزەمینە و بۆ ماوەی دوو ساڵ و شەش مانگ، فەرمانڕەوایەتی کرد.

کاتێك عومەر کوڕی عەبدولعەزیز هاتە سەر کار، سەمح کوڕی مالکی خەولانی وەك فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدا، زەوییەکانی بپێوێت و ئەوەی بەزۆری شمشێر دەستی بەسەردا گیراوە، جیابکاتەوە و پێنج یەکیان لێوەربگرێت و چۆنیەتی ئەم کارە بۆ خەڵکانی ئاندۆلۆس، ڕوون بکاتەوە. مەبەستی ئەوە بوو خەڵکان لەوێ کۆچ پێبکات چوونکە ئەوان لەموسوڵمانەکان جیاببوونەوە. سەمح لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٠٠/ ئاوریلی ٧١٩ زایینی گەیشتە ئەو شارە و فەرمانەکانی عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی ئەنجامدا. کاتێك لەشەڕ دەگەڕایەوە (لەساڵی ١٠٢/ ٧٢٠ – ٧٢١ زایینی) کوژرا. لەم کاتەدا بۆچوونی عومەر بۆ کۆچ پێکردنی خەڵکەکەی گۆڕابوو لەبەر ئەمە خەڵکانی لەو سەرزەمینە هێشتەوە و لەخوا بۆ خەڵکان پاڕایەوە ( یا فەرمانی گەڕانەوەی بەخەڵکەکەیدا.)

دواتر بەدوای سەمەح، عەبسە کوڕی سەحیمی کەلبی لەساڵی ١٠٣/ ٧٢١ – ٧٢٢ زایینی، فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست و لەمانگی شەعبانی ١٠٧/ دێسامبەری ٧٢٥ زایینی، لەکاتی

فەرمانڕەوایەتی عاسم کەمتر لەیەك ساڵی خایاند. ئەسەد ئەوی خستە زیندان و لێپرسینەوەی لەگەڵ کرد و خوازیاری سەد هەزار درەم بوو. وتی: تۆ بەختەوەر نەبوویت. ئەسەد، عومارە کوڕی حورەیم و کارگوزارەکانی جونەیدی ئازاد کرد.

کاتێك ئەسەد هات، تەنیا مەرو و نەیشابوور لەژێر دەستی عاسمدا نەبوو. حارس لەمەرورود ۆ خالید کوڕی عەبدوڵلای هیجری لەئامول و هاوپەیمانی حارس بوو. ئەسەد لەوە ترسا کەئەگەر مەبەستی هێرش کردن سەر حارس لەمەرورود بکات، هیجری لەئامولەوە پێشڕەوی دەستپێبکات و ئەگەر هێرش بکاتە سەر هیجری، حارس لەمەرورودەوە، هێرشی بکاتەسەر. سەرئەنجام بڕیاریدا عەبدولرەحمان کوڕی نوعەیم لەگەڵ خەڵکانی کوفە و شام بۆ هێرش کردنە سەر حارس ڕەوانەی مەرورود بکات و خۆی هێرش بکاتە سەر هیجری لەئامول و خەڵکەکەی لەگەڵ خۆی ببات. کاتێك گەیشتە ئامول، سوپای ئامول بەسەرکردایەتی زیادی قورەشی موالی حەیانی نەبتی وەك سەرکردەی سوارەکان، ڕووبەڕوی بوویەوە بەڵام شکستی خوارد و بۆ ناو شارەکە پاشەکشێیان کرد. ئەسەد گەمارۆی خستە سەر ئەوان و کەشکەنجیرەکانی بۆ دانان. سەرکردەی ئەوان هیجری یەکێك لەهاوەڵانی حارس بوو. خەڵك خوازیاری ئەمان بەخشین بوون. ئەسەد کەسی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد و وتی: چیتان دەوێت؟ وتیان: نووسرای خواوەند و شێوەی پێغەمبەر(د.خ) و ئەوەی خەڵکی ئامول لەتاوانی گوناحەکەی ئێمە، سزا نەدەن. ئەسەد ڕازی بوو و یەحیا کوڕی نوعەیم کوڕی هوبەیرەی شەیبانی وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەسنیشان و بەرەو بەڵخ بەڕێکەوت. ئاگاداریان کردەوە کەخەڵکی بەڵخ لەگەڵ سلێمان کوڕی عەبدوڵلە کوڕی خازم بەیعەتیان کردووە. بەڕێکەوت تا گەیشتە ئەو شارە. سوار کەشتی ولەوێوە بەرەو تێرمێز بەڕێکەوت و بینی حارس گەمارۆی خستۆتەسەر و سەنانی ئەعرابی لەوێیە. ئەسەد لەمبەری روبارەکە دابەزی بەڵام نەیتوانی بپەڕێتەوە و نەیتوانی هاوکاری ئەوان بکات. خەڵکانی تێرمێز هاتنەدەر و لەگەڵ حارس شەڕیان کرد. حارس پاشەکشێی کرد و گەڕایەوە. ئەو شەڕکەرانی لەسەر ڕێگەکەی ئەوان دانابوو. خەڵکانی تێرمێز شوێنی کەوتن. نەسر کوڕی سەیار لەگەڵ ئەسەد سەیری ئەم دیمەنەیان دەکرد. رووی گرژ کرد و زانی حارس بۆسەی بۆ ئەوان ناوەتەوە. ئەسەد گومانی کرد بۆیە رووی گرژ کردەوە چوونکە بەزەیی

بەحارسدا هاتۆتەوە لەکاتی پاشەکشێ کردن. مەبەستی ئەوەی کرد سەرکۆنەی ئەسر بکات کە لەناکاو ئەوانەی بۆسەیان دانابوو، هێرشیان کردە سەر خەڵکان و شکستیان پێهێنان.

ئەسەد بەرەو بووخارا بەرێکەوت و خەڵکی تێرمێز هێرشیان کردەسەر حارس و شکستیان پێهێنا و دەستەیەك لەشارەزایان و فرەزانانیان کوشت کەعێکرەمە و باوکی فاتیمە لەناو ئەواندا بوون. ئەسەد بەرەو سەمەرقەند بەرێکەوت و لەم شارە تێپەڕی و بەرەو زەم ڕۆشت. کاتێك گەیشتە زەم، کەسی بۆ لای هەیسەمی شەیبانی (لەهاوەڵانی حارس کە لەناو یەکێك لەقەڵاکاندا بوو)) ڕەوانە کرد و پێی وت: ئێوە فەرمانڕەواکانتان بۆ کارە نەشیاو و قێزەونەکان سەرکۆنە دەکەن بەڵام دیل گرتن و دەست درێژی کردن بۆ داوێنی پاکی ژنان و زاڵبوونی بتپەرستان، نەگەشتە ئەو رادەی کە لەسەمەرقەند روویدا. من خوازیاری سەمەرقەندم و پەیمان و ئەمانی خوایی بەتۆ دەبەخشم و بەڵێن دەدەم هیچ زیانێکت بەرنەکەوێت. تۆ و هاوەڵانت ئەمانتان پێدەبەخشرێت. ئەگەر بەداواکاریەکەم رازی نەبیت، پەیمانی خوایی لەئەستۆی مندا بێت کەتەنانەت ئەگەر یەك تیر بهاوێژیت، چیتر بەهیش شێوەیەك ئەمانت پێنەبەخشم و ئەگەر هەزار ئەمانت پێببەخشم، هیچ کات پێبەندی بەڵێنەکەم نەبم. ئەو لەسەر بەخشینی ئەمانی ئەسەد خۆی تەسلیم کرد و هاورێ لەگەڵ ئەو بەرەو سەمەرقەند بەرێکەوت و لەوەرەغسەرا تێپەڕی کەئاوی سەرمەقەند لەوێوە ڕەوانە. دۆڵەکەی بەست و زیانی ئەوی لەشارەکە دوورکردەوە و دواتر بۆ بەڵخ گەڕایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: داستانی ئەسەد و هاوەڵانی حارس لەساڵی ١١٨/ ٧٣٦ زاییندا روویداوە.

## بەسەرهاتی بانگەشەکەران بۆ بەنی عەباس

دەڵێن: لەم ساڵەدا، ئەسەد کوڕی عەبدوڵڵە دەستەیەك دەستەیەك لەبانگەشەکەرانی عەباسی گرت و چەند کەسێك لەوانی کوشت و گووێ و لوت و پێ و دەستی دەستەیەکی دیکەی بڕییەوە و دەستەیەکی دیکەی خستە زیندانەوە. لەناو ئەسیرەکان، ئەم کەسانە دەبینران: سلێمان کوڕی کەسیر، مالیك کوڕی هەیسەم، موسا کوڕی کەعب، لاهیز کوڕی

ئەوەی کرد ریسوای بکات. رۆژێك کەسوپاییەکان لای ئەو ئامادە بوون، فەرمانی پێدان جوێن و شەقەزللەی لێبدەن و دەریبکەن. سومەیل هاتەدەر و خەڵکان بینیان دەستارەکەی سەری خوار بووە. یەکێك لەدەرگاوانەکان پێی وت: بۆ دەستارەکەت خوار بووە؟ وتی: ئەگەر بنەماڵە و هۆزێکم هەبێت، راستی دەکەنەوە. کەسی بۆ لای خەڵکەکەی رەوانە و سکاڵای گەیاندە لای ئەوان. وتیان: شوێنکەوتەی فەرمانەکانی تۆین. بۆ سەوابە کوری سەلامەی جوزامی (لەخەڵکانی فەلەستین) پەیك و نامەیان نارد. سەوابە پەیوەستیان بوو و خەڵکانی لەخم و جوزەیم، شوێنیان کەوتن.

باوکی خەتار لەم کارە ئاگادار بوویەوە. هێرشی کردە سەر ئەوان. رووبەرووی باوکی خەتار بوونەوە و هاوەڵانی هەڵاتن و باوکی خەتار، گرفتار بوو. سەوابە رۆشتە ناو کۆشکی کوردوبا و باوکی خەتار، زنجیر لەدەست و پێ، لای ئەو بوو. سەوابە، بۆ ماوەی دوو ساڵ فەرمانرەوایەتی ئاندۆلۆسی کرد و مرد. خەڵکانی یەمان هەوڵیاندا باوکی خەتار بۆ سەرکارەکەی بگەرێنەوە. خەڵکانی میسر شۆرشیان دەسپێکرد و سومەیلیان وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد و بەمشێوەیە، دووبەرەکی لەناو خەڵکان هاتە ئاراوە. ئاندۆلۆس بۆ ماوەی چوار مانگ بێ فەرمانرەوا بوو کەگێرانەوەی بەسەرهاتەکان بەشێوەیەکی سادەتر و کورتتر لێرەدا، لەگێرانەوەی رووداوەکانی ساڵی ١١٧/ ٧٣٥ زایینی، ئاماژەی پێدرا.

کاتێك بێ فەرماندار مانەوە، عەبدولرەحمان کوری کەسیری لەخمییان وەك فەرمانرەوا هەڵبژارد بەڵام کێشتە هاتە کایەوە و لەبەر ئەمە لەسەر فەرمانداری یوسف کوری عەبدولرەحمان کوری حەبیب کوری ئەبی عوبەیدەی ئەهری، رێککەوتن کە لەساڵی ١٢٩/ ٧٤٦- ٧٤٧ زایینی، هاتە سەرکار. بریاریاندا بۆ ماوەی یەك ساڵ فەرمانرەوایەتی بکات و دواتر فەرمانرەوایەتی، بەخەڵکانی یەمان، بسپێرێت تا یەکێك لەخۆیان وەك فەرماندار، دەستنیشان بکەن.

کاتێك ساڵەکە تەواو بوو، خەڵکانی یەمەن مەبەستی ئەوەیان کرد یەکێك لەبنەماڵە و خەڵکەکەی خۆیان، بێننە سەرکار. سومەیل بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەرئەوان و دەستەیەکی فراوان لەوانی کوشتار کرد. ئەمە هەمان شەری ناوداری شەقەندەیە. لەم شەرەدا بوو باوکی خەتار کوژرا و خەڵکان ئەوەندە بەرەمەکان شەر و لەیەکیاندا بەتەواوی شەکەت بوون و بەشمشێری شەریان کرد تا ئەو کاتەی شمشێرەکان، کول بوون و لەکار کەوتن. دواتر پەلاماری قژی یەکتریاندا و شەری دەستەویەخە دەستیپێکرد. ئەمە لەساڵی ١٣٠/ ٧٤٧ — ٧٤٨

زایینی روویدا. خەڵك لەسەر فەرمانبەری کردن لەیوسف رێککەوتن و کەس دژایەتی ئەوی نەکرد.

ئامازەیان بەگێڕانەوەی دیکەداوە کە لەکاتی گێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ١٢٧/ ٧٤٤ — ٧٤٥ زایینی، باسمان کرد.

دواتر بۆ چەندین ساڵی بەردەوام وشکەساڵی و قاتوقڕی لەئاندۆلۆس روویدا و خەڵکەکەی کۆچیان کرد. کاروبارەکان شڵەژا و پەرێشانی و ئاڵۆزی تا ساڵی ١٣٦/ ٧٥٣ زایینی، درێژەی کێشا. لەم ساڵەدا تەمیم کوڕی مەعبەدی فێهری و عامری عەبدەری لەشاری ساراگوسا کۆبوونەوە و سومەیل بۆ شەڕی ئەم دووانە بەرێکەوت و بەدوای ئەو، یوسفی فێهری بۆ شەڕی ئەوان بەرێکەوت و هەردووکیانی کوشت. یوسف لەئاندۆلۆس مایەوە تا ئەو کاتەی عەبدولرەحمان کوڕی معاویە کوڕی هوشام، دەستی بەسەر ئاندۆلۆسدا گرت.

ئەمەیە بەسەرهات وگێڕانەوەکانی ئاندۆلۆس کە بەشێوەیەکی چڕوپڕ، باسمان کرد. بەشێوەیەکی سادەتر و پوختتر، پێشتر ئامازەمان پێدابوو. لەبەر ئەوە لێرەدا بەم شێوەی رووداوەکانمان گێڕایەوە تا رووداوەکانی ئاندۆلۆس پەیوەستی یەك ببن چوونکە پێشتر بەشێوەیەکی بەربڵاو ئامازەمان پێدابوو. ئێستا دەگەڕێینەوە سەرباسی عەبدولرەحمان کوڕی معاویە کوڕی هوشام.

## درێژەی کارەکانی عەبدولرەحمان

بەلام چۆنیەتی رۆشتنی عەبدولرەحمان بۆ رۆژئاوا بەمشێوەیە کەلەو دەگێڕنەوە: کاتێك دەوڵەتی عەباسی دەرکەوت و ئومەوییەکان و شوێنکەوتەکانیان کوشتار کران، ئەوانەی توانیان گیانی خۆیان دەرباز بکەن، هەلاتن. عەبدولرەحمان کوڕی معاویە لەزات زەیتوون بوو. لەوێوە بۆ فەلەستین هەلات و لەگەڵ کۆیلەکەی، بەدر، بەدوای هەواڵەکاندا رۆشت. لەو دەگێڕنەوە کەوتی: کاتێك ئەمانیان بەئێمە بەخشی و لەکەنارەکانی رووباری ئەبوو فوتورس، پەیمانەکەی خۆیان پێشێل و خوێنی ئێمەیان رەو کرد، منیان ئاگادار کردەوە و من دوو لەچاوی خەڵکانی ژیان بەسەر دەبرد. رۆژێك، بێ هیوا و سەرگەردان بۆ ماڵەوە گەڕامەوە و بۆ باشتر کردنی ژیانی خۆم و بنەماڵەکەم، تێفکریم. بەترسەترس هاتمەدەر و لەناو مێرگەلان و دارستان لەکەنارەکانی فورات، رۆشتمە ناو گوندێك. رۆژێك لەوێ مامەوە. کوڕە چوارساڵەکەم، سلێمان لەبەردەممدا، گەمەی دەکرد. لەناکاو بینیم ئەو گۆڕا چوونکە لای من

ڕۆشتەدەر و دواتر بەگریانەوە هاتە ژوورو خۆی هەڵدایە ناو ئامێزی من. ئەوم دوور دەخستەوە بەڵام دووبارە خۆی بەمنەوە هەڵدەواسی. ڕۆشتمەدەر تا بزانم چی ڕوویداوە. بینیم، ترس سەراسەری گوندەکەی داپۆشیوە و بەناڵای ڕەش گەمارۆدراوە. سالی برام بەردەوام دەیوت: رابکەن، رابکەن! ئەوە ئاڵا ڕەشەکان! چەند دینارێکم هەڵگرت و خۆم و براکەم، رزگار کرد و خوشکەکانم لەمەبەستەکەی خۆم ئاگادار کردەوە و فەرمانم پێدان لەگەڵ کۆیلەکەم، بەدر، خۆیان بەمن بگەیێنن. سوارەکان گەمارۆی گوندەکەیاندا بەڵام نەیانتوانی من بدۆزنەوە. ڕۆشتمە لای یەکێك لەناشناکانی خۆم و فەرمانم پێدا ساز و بەرگ و توێشو و چوارپێم، بۆ بکرێت. کۆیلەکەی ئەو، فەرمانداری لەبوونی من ئاگادار کردەوە. فەرماندار لەگەڵ سوارەکانی خۆی بەدوای گەڕان. ڕۆشتینە ناو بێستانەکانی کەنارەکانی فورات و پێش ئەوان خۆمان هەڵدایە ناو فورات و مەلەمان کرد. رزگارم بوو. سوارەکان هاواریان دەکرد گەڕێنەوە و ئەمانم پێبەخشراوە بەڵام نەگەڕامەوە. براکەم لەنیوەی ڕێگە چیتر نەیتوانی لەسەر مەلە کردن بەردەوام بێت و بەپشت بەستن بەئەمانەکەی ئەوان، گەڕایەوە. ئەویان سەر بڕی و من سەیرم دەکرد. سیانزە ساڵی بوو. داخی ئەوم لەدڵ هەڵگرت و هەڵاتم و خۆم کردە بەناو دارستانە چڕەکاندا. ئەوان، چیتر شوێنم نەکەوتن. مەبەستی ڕۆشتن بۆ ڕۆژئاوام کرد و خۆم بەئەفریقییە، گەیاند.

دواتر خوشکەکەی دایکی سەبغ، کۆیلەکەی، بەدری، لەگەڵ گەوهەر و زێڕ و زیو، بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتە ئەفریقییە، عەبدولرەحمان کوڕی حەبیبی فێهری کوڕی ئەبی عوبەیدەی فێهری سەرسەختی لەخۆی نیشاندا. دەڵێن ئەو باوکی یوسف کارگوزاری ئاندۆلۆس بوو. هەڵات و پەنای بۆ خەڵکانی مەکناسە (هۆزێك لەبەربەرەکان) برد. لەوێ گیرۆدەی ڕەنج و دژوارییەکان بوو کەباس کردنیان دەبێتە هۆی درێژدادڕی لەم کتێبەدا. دواتر لای ئەوان هەڵات و ڕۆشتە لای خەڵکانی نێفزاوە کەخاڵەکانی بوون. بەدر، هاوڕێیەتی ئەوی دەکرد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو، ڕۆشتە لای خەڵکانێك بەناوی زەناتی کە بەگەرمی پێشوازییان لێکرد و توانی لەوێ ئارام بگرێت و دەستی بەسامانداری و ڕێکخستنی کارەکانی خۆی کرد. نامەی بۆ ئومەوییەکانی نیشتەجێی ئاندۆلۆس نووسی و پێشنیاری فەرمانبەری کردنی پێکردن. کۆیلەکەی خۆی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد. فەرمانداری ئاندۆلۆس لەم کاتەدا یوسف کوڕی عەبدولرەحمانی فێهری بوو.

بەدر ڕۆشتە لای ئەوان و لەکارەکانی عەبدولرەحمان ئاگاداری کردنەوە. رازی بوون و چەندین کەشتییان بۆ نارد کەسەمامە کوڕی عەلقەمە، وەهب کوڕی ئەسغەر و شاکر کوڕی ئەبی شەمیت، لەناویاندا دەبینران. خۆیان بەو گەیاند و فەرمانبەری و ملکەچی خۆیان نیشاندا. ئەو، لەمانگی رەبیع الاوەل ١٣٨/ ئوتی ٧٥٥ زایینی لەمەنکەب، لەنگەری خست.

دەستەیەك لەگەورەکانی ئەوان لەخەڵکانی سومیل، ڕۆشتنە لای. دڵی خەڵکانی یەمەن لێوانلێو بوو لەڕقی سومەیا و یوسفی فێهری. ئەوانیش پەیوەستی بوون. دواتر رووی کردە شاری رییە کەفەرمانداره‌کەی عیسا کوڕی مساوەر، بەیعەتی لەگەڵ کرد. دواتر بەرەو شەزوونە بەرێکەوت و غیاس کوڕی عەلقەمەی لەخمی دەستی بەیعەتی بۆ درێژ کرد. بەدوای ئەم شارە، بەرەو موروو بەرێکەوت و فەرمانداره‌کەی کوڕی شەجەرە، پەیمانی فەرمانبەری پێدا. دواتر بەرەو سومیل بەرێکەوت و لەوێ باوکی سەباح یەحیا کوڕی یەحیا بەیعەتی لەگەڵ بەست. دواتر بەرەو کوردوا بەرێکەوت.

یوسف لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە. لەم کاتەدا لەشوێنی مانەوەی خۆیۆ نەبوو و لەتولدوو، ژیانی بەسەر دەبرد. کاتێك بەرەو کوردوبا دەڕۆشت، ئەم هەواڵەی پێگەیشت. عەبدولرەحمان بەرەو کوردوا بەرێکەوت.

کاتێك گەیشتە کوردوا، بەمەبەستی بەستنی پەیمانی ئاشتی، نامەی بۆ یوسف نووسی و پەیك و پەیام لەنێوان ئەم دووانە، هاتوچۆیان دەکرد. لەماوەی دوو رۆژدا ئەوی فریودا کەیەکیان رۆژی عەرەفە (نۆی زیحەججە/ ٤ مەی ٧٥٧ زایینی بوو) هەموو هاوەڵانی یوسف لەبەستنی پەیمانی ئاشتی دڵنیا بوون. یوسف دەستی بەئامادە کردنی خواردن کرد تا خەڵك لەرۆژی جەژنی قوربان لەسەر سفرەکەی بیخۆن و سپاسی خواوەند، بەجێ بێنن. عەبدولرەحمان سەرقاڵی ئامادە کردنی سوار و پیادەکانی خۆی بوو. ئەو، شەوانە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەرووبار تێپەری و شەڕ، لەشەوی جەژنی قوربان، دەستی پێکرد. هەردوولای شەڕکەر، خۆڕاگریان کرد تا ئەو کاتەی خۆر، هەڵات. عەبدولرەحمان سوار ئێسترێك بوو تا خەڵكان گومانی هەڵاتنی ئەو نەکەن. کاتێك ئەمەیان بینی، دڵیان ئارام و کوشتاری هاوەڵانی یوسفیان دەستپێکرد. یوسف هەڵات و سومەیل لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەهاوەڵانی مایەوە بەڵام لەکۆتاییدا شکستیان خوارد و هەڵاتن. عەبدولرەحمان سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کاتێك یوسف شکستی خوارد، روویکردە مارده و عەبدولرەحمان، ڕۆشتە ناو کوردوا. هاوەڵان و نۆکەرەکانی یوسفی سوار لەسەر (عودە) (وشتری پیر) لەو شارە دەرپەڕاند و جێگەی

ئەوانی گرتەوە.

دواتر، بەمەبەستی دۆزینەوەی یوسف، هەوڵەکانی خستەگەڕ. کاتێك یوسف لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، ڕێگەی گۆڕی و ڕێگەی کوردوای گرتەبەر. دەستی بەسەر کۆشکی شارەکەدا گرت و هەموو کەسان و سامانەکانی خۆی هەڵگرت و ڕوویکردە شاری ئەلبیرە. سومەیل لەشاری شوزەی خۆی بەو گەیاند.

عەبدولرەحمان لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و بەرەو کوردوا گەڕایەوە بەو هیوایەی بتوانێت یوسف بگرێت. کاتێك ئەوی نەبینی، مەبەستی ئەوەی کرد بۆ شەڕی ئەو، بەرێکەوێت. ڕۆشتە ئەلبیرە. سومەیل پەیوەستی یوسف ببوو و خەڵکانێك لەدەوری ئەم دوو کەسە کۆببوونەوە. بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی پەیك و پەیامیان ڕەوانە کرد. لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەیوسف لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ئەمانی پێببەخشرێت و تەسلیم ببێت و لەگەڵ عەبدولرەحمان لەکوردوا، بمێنێتەوە.

یوسف دوو کوڕەکەی خۆی وەك بارمتە بەو سپارد. کاتێك ڕۆشتە کوردوا، ئەم هۆنراوەی وەك ئەنجامی کارەکەی خۆی، خوێندەوە:

فبینانسوس الناس و الامرامرنا        اذانحن فیهم سوقة نتنصف

(اذا نحن فیهم سوقة لیس ننصف)

یانی: لەگەرماوگەرمی فەرمانڕەوایەتی کردن بەسەر خەڵکان و لەدەست گرتنی هەموو کاروبارەکان، لەناکاو هاتینە ریزی کۆمەلانی خەڵك کەخۆمان داوای ئەمانمان دەکرد.

عەبدولرەحمان لەکوردوا ئارامی گرت و کۆشك و مزگەوتی گشتی ئەو شارەی دروست کرد. هەشتا هەزار دیناری بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کرد بەلاَم پێش ئەوەی کۆتایی بەکارەکەی بێنێت، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. ئەو چەندین مزگەوتی گەورەی دروست کرد و ڕێزی لەو کەسانە گرت کەپەیوەستی ببوون. ئەویان بەمەنسور ناو دەبرد.

## گێڕانەوەیەکی دیکە :

ئەبووجەعفەری تەبەری وتوویەتی ڕۆشتنە ناوەوەی عەبدولرەحمان لەساڵی ١٣٩/ ٧٥٦ زایینی روویدا و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٣٨/ ٧٥٥ زایینی. پێشتر ئاماژەمان پێدا.

باس کردنی چۆنیەتی دەست بەسەرداگرتنی ئاندۆلۆس لەلایەن عەبدولرەحمانەوە بەم ئەندازەیە بەسە چوونکە تەنیا مەبەستمان ئەوە بوو گێڕانەوەی رووداوەکانمان بەشێوەیەکی چڕوپڕ لەبیر نەکردبێت.

## زیندانی کردنی عەبدوالله کوڕی عەلی

کاتێك سلێمان لەبەسرە، لەسەرکار لابرا، براکەی عەبدوالله کوڕی عەلی و هاوەڵان و هاوڕێکانی، لەترسی مەنسور، خۆیان داشارد. مەنسور لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و کەسانێکی بۆ لای سلێمان و عیسا (کوڕەکانی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس) ڕەوانە کرد تا عەبدوالله بۆ لای ئەو ڕەوانە بکەن. ئەمانی عەبدواللەی بۆ ئەم دووانە نارد و سوێندی خوارد، ڕێز لەبەڵێنەکەی خۆی بگرێت.

سلێمان و عیسا لەگەڵ عەبدوالله و سەرکردەی سوپاکەی ئەو و کۆیلەکانی بەرێکەوتن و لەمانگی زیحەججە، مەی ٧٥٧ زایینی، گەیشتنە لای مەنسور. کاتێك ڕۆیشتنە لای مەنسور، مۆڵەتی سەردانی بەسلێمان و عیسادا. ئەم دووانە ڕۆشتنە لای مەنسور و لەهاتنی عەبدوالله ئاگاداریان کردەوە و داوای مۆڵەتیان بۆ ئەویش کرد. وەلامی ئەوانی دایەوە و بەگفتوگۆ، سەرقاڵی کردن. بۆ عەبدوالله لەکۆشکەکەی خۆی شوێنێکی دیاریکردبوو تا دوای هاتنی عەبدوالله و عیسا، بڕواتە لای ئەوان. ئەویان بردە شوێنە تایبەتەکە. مەنسور هەستا و وتی: عەبدوالله لەگەڵ خۆتان ببەن. کاتێك هاتنەدەر، عەبدواللەیان نەبینی. بەلام نەیانتوانی بۆ ژوورەوە بگەڕێنەوە. لەم کاتەدا شمشێری هاوەلان و کۆیلەکانی ئەوانیان وەرگرت و ئەوانیان زیندانی کرد.

خەفاف کوڕی مەنسور ئەوانی ئاگادار کردبوویەوە کەگرفتار دەبن. لەهاتن لەگەڵ ئەوان پەشیمان بوویەوە و وتی: ئەگەر فەرمانەکانی من ئەنجام دەدەن، لەناکاو و هاوشێوەی یەك کەس، هێرش دەکەینە سەر ئەبووجەعفەری مەنسور و خوێنی دەرێژین.

سوێند بەخوا هیچ ڕێگرێکمان نییە بۆ لەناو بردنی ئەو. هەرکەس مەبەستی زیان گەیاندن بەئێمە بکات، دەیکوژین و خۆمان ڕزگار دەکەین. بەلام ڕازی نەبوون.

کاتێك شمشێرەکانی ئەوانیان وەرگرت و زیندانیان کردن، خەففاف دەستی بۆ ڕیشی خۆی برد و تفی لەهاوڕێکانی کرد. دواتر مەنسور فەرمانیداو ژمارەیەك لەوانیان لەبەردەم چاوی خۆیدا کوشت و کەسانیتریان بۆ لای باوکی داوود خالید کوڕی ئیبراهیم بۆ خوراسان نارد کە لەوێ هەموویانی کوشتار کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا یا ساڵی ١٤٠/ ٧٥٧ — ٧٥٨ زایینی، سلێمان کوڕی عەلی لەفەرمانڕەوایەتی بەسرە، دوورخرایەوە و سوفیان کوڕی معاویە لەمانگی ڕەمەزان، فەوریەی ٧٥٧ زایینی، وەك فەرماندار، دەستنیشان کرا.

عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی، لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایف، زیاد کوڕی عەبدوڵلای حارسی بوو، فەرمانداری کوفە، عیسا کوڕی موسا، فەرمانداری بەسرە، سوفیان کوڕی معاویە، سەرپەرەستی دامەزراوەی بەسرە، سوار کوڕی عەبدوالله و فەرمانڕەوای خوراسان، باوکی داوود بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەبد ڕەببە سەعید کوڕی قەیسی ئەنساری کەدەستەیەك دەڵێن لەساڵی ١٤١/ ٧٥٨ زایینی، مرد، عەلاء کوڕی عەبدولرەحمان موالی خەرەقە، محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەبدولرەحمان باوکی سەعسەعەی مازنی، یەزید کوڕی عەبدوالله کوڕی شەداد کوڕی هادی لەیسی کە لەئەسکەندەرییە، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چلی کۆچی ( ٧٥٧- ٧٥٨ زایینی )

## لەناوچوونی باوکی داوود کارگوزاری خوراسان و فەرمانداری عەبدجەبار

لەم ساڵەدا باوکی داوود، خالید کوڕی ئیبراهیمی زوهەلی، کارگوزاری خوراسان لەناوچوو.

هۆکاری لەناوچوونەکەی ئەوە بوو کە: دەستەیەك لەسوپاییەکان لەو کاتەی ئەو لەکوشماهەن بوو. دژی ئەو ڕاپەڕین و خۆیان گەیاندە ماڵەکەی ئەو. لەشەودا، لەسەر بانی ماڵەکەیەوە خۆی نیشانی ئەواندا. قاچی خستە سەر لێواری خشتێکی لەق، خشتەکە خزا. باوکی داوود کەوت و پشتی شکا و لەکاتی نوێژی خەوتنان، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. دوای ئەو، سەرکردەی پاسەوانەکانی بەناوی عەسام، کاروبارەکانی گرتەدەست تا ئەو کاتەی عەبدجەبار کوڕی عەبدولرەحمانی ئەزدی وەك فەرمانداری تازە گەیشتە خوراسان. کاتێك گەیشتە شارەکە، دەستەیەکی لەناو فەرماندەکان هەڵبژارد کەخەڵکانیان بۆ فەرمانبەری کردن لەبنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالب هاندەدا. ئەم کەسانە لەناویاندا بوون: موجاشیع کوڕی حورەیسی ئەنساری کارگوزاری بووخارا، باوکی موغەیرە خالید کوڕی کەسیر موالی بەنی تەمیم کارگوزاری (کەسهتان)، حورەیش کوڕی محەممەدی دوهەلی ئامۆزای باوکی داوود. ئەوانی کوشت و کەسانی دیکەی خستە زیندانەوە و زەختی لەکارگوزارەکانی باوکی داوود کرد تا سامانەکانیان لەدەست دەربێنێت.

## کوژرانی یوسفی فیهری

لەم ساڵەدا یوسفی فیهری پەیمانەکەی خۆی لەگەڵ عەبدولرەحمانی ئومەوی، فەرمانداری ئاندۆلۆس، خستە ژێرپێ و ئاڵای نافەرمانی کردنی بەرز کردەوە.

چۆنیەتیەکەی ئەوەی: عەبدولرەحمان کەس یا کەسانێکی وەك چاودێری کاروبارەکانی ئەودانا بوو تا ڕیسوای بکەن و لەسەر سامانەکانی مشتومڕی لەگەڵ بکەن و هەوڵ بدەن هەموو ماڵ و داراییەکەی لەدەست دەربێنن. کاتێك ئەو لەئایینی ئیسلام بەڵگەی بۆ دەهێنانەوە، ڕازی نەدەبوون و وتەکانیان پشتگوێ دەخست. هەستی بەو بەلا و زیانی ئەوان کرد. مەبەستی ڕۆشتن بۆ ماردەی کرد و لەوێ نزیکەی بیست هەزار پیاوی شەڕکەر لەدەوری کۆبوونەوە. هێرشی کردە سەر عەبدولرەحمان. عەبدولرەحمان هاتەدەر و ڕووبەڕووی

بوویەوە و لە کوردواوە بەمەبەستی هێرش کردنە سەر یوسف، بەرەو قەڵای مودەوەر ڕۆشت.

دواتر یوسف بەباشی زانی بەرەو لای عەبدولەلیك کوڕی عومەر کوڕی مەروان فەرمانداری سومەیل، بڕوات. هەروەها ڕووی کردە کوڕەکەی عومەر کوڕی عەبدولەلیك کەفەرمانداری مودەوەر بوو. بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت بەڵام ئەم دووانە لەشارەکانی خۆیان هاتنەدەر و ڕووبەرووی بوونەوە و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد کەدەرئەنجامەکەی سوپاکەی یوسف شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. یوسف هەڵات و ئاوارەی سەرزەمینەکان بوو. یەکێك لەهاوەڵانی لەرەجەبی ساڵی ١٤٢/ نۆڤەمبەری ٧٥٩ زایینی ئەوی کوشت. ئەویان لەنزیك تۆلدۆ کوشت و سەریان بۆ عەبدولرەحمان نارد. ئەو، سەری یوسفی لەکوردوا، هەڵواسی و نیشانی خەڵکانیدا. هەروەها عەبدولرەحمان کوڕی یوسفی کوشت کەوەك بارمتە لای ئەو بوو. سەری ئەویشی هەڵواسی. باوکی ئەسوەد کوڕی عەبدولرەحمان وەك بارمتە لای ئەو مایەوە کەدواتر ئاماژە بەبەسەرهاتەکەی دەدەین.

بەڵام سومەیل، کاتێك هەڵاتنی یوسفی لەکوردوا بینی، هاوڕێ لەگەڵ ئەو هەڵنەهات. ئەمیر عەبدولرەحمان ئەوی بانگ کرد و بەردەوام سەبارەت بەیوسف، لێیدەپرسی. سومەیل وتی: منی لەکارەکانی خۆی ئاگادار نەکردەوە و هیچ نازانم. عەبدولرەحمان وتی: بەناچاری دەبێت لەشوێنی خۆحەشاردانی ئەو ئاگادارم بکەیتەوە. سومەیل وتی: ئەگەر لەژێر قاچمدا بێت، قاچ هەڵناگرم. عەبدولرەحمان خۆی و دووکوڕەکەی، زیندانی کرد. کاتێك ئەم دووانە هەڵاتن، سومەیل لەهەڵاتن شەرمی کرد و لەزیندان نەڕۆشتەدەر. ماوەیەك دواتر، پیرانی موزەرییەکان بردە لای ئەو و بینیان لەتەنیشت قاپێك، گیانی ئەسپەردە کردووە و چەند نوقڵێکی لەدوای خۆی بەجێهێشتوە. وتیان: ئەی باوکی جەوشەن،، باش دەزانین تۆ لێت نەچێشتوە بەڵکو دەرخواردی تۆیان داوە. جەستەی ئەویان تەسلیمی بنەماڵەکەی کردەوە و بەخاکیان سپارد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ئالفۆنسۆ، پاشای گالیسیا،ماڵئاوایی لەجیهان کرد و کوڕەکەی، تەدویلییە، هاتەسەر کار. ئەو لەباوکی بوێرتر و بۆبەڕێوەبردنی وڵات، شارەزاتر و بەهێزتر بوو. باوکی بۆ ماوەی هەژدە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. کاتێك ئەم کوڕە هاتە سەر تەخت، هێز و دەسەڵاتی زیادی کرد و پاشایەتییەکەی فراوان بوو. ئەو، موسوڵمانانی لەسنووری وڵاتەکەی

دوورخستەوە و دەستی بەسەر شارەکانی لۆك (لۆگۆ)، پورتوغال، سالامانکا، شەمورە، ئەبیلە (ئاویلا) سەگوویا و فەشتالە گرت کەهەموویان لەشارەکانی ئاندۆلۆس بوون.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور، برازاکەی، عەبدوەهاب (کوڕی ئیبراهیمی ڕێبەر) و حەسەن کوڕی قەحتەبەی لەگەڵ حەفتا هەزار شەڕکەر، بۆ شەڕ ڕەوانە کرد. ئەمان، لەوێ دابەزین و ئەوەی لەسەر دەستی رۆمیان وێران کرابوو، نۆژەنیان کردەوە و لەماوەی شەش مانگ، کۆتاییان بەکارەکەیان هێنا. حەسەن لەم کارە، شارەزایی و لێهاتووی فراوانی لەخۆی نیشاندا. مەنسور چوار هەزار شەڕکەری لەم ناوچەیە نیشتەجێ کرد و توێشو و کەرەستەی شەڕی بۆیان نارد و بناغەی قەڵای قەلوزییەی داڕشت.

کاتێك پاشای رۆم بیستی کەعەبدوەهاب و حەسەن بەرەو مەڵتییە بەڕێکەوتون، لەگەڵ سەد هەزار شمشێر وەشێن، بەمەبەستی هێرش کردنە سەر ئەوان بەڕێکەوت و لەجەیحان دابەزی. لەفراوانی سوپای ئیسلام ئاگاداریان کردەوە، لەبەر ئەمە پاشەکشێی کرد. کاتێك مەڵتیە سەر لەنوێ ئاوەدان کرایەوە، کەسانێك لەدانیشتوانی ئەو شارەکە پێشتر شارەکەیان بەجێهێشتبوو، گەڕانەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور، مەبەستی حەج کردنی کرد. لەحیرەوە ئەحرامی بەست و کاتێك لەحەج تەواو بوو، بەرەو بیت المقدس و لەوێوە بەرەو ڕەقە، ڕۆشت. لەڕەقە مەنسور کوڕی جەعونەی عامری کوشت و گەڕایەوە بۆ هاشمیەی کوفە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور فەرمانیدا شاری مەسیسیە لەسەر دەستی جبرائیل کوڕی یەحیا، سەر لەنوێ ئاوەدان بکرێتەوە. بوورج و دیواری ئەم شارە بەهۆی ئەردهەژێنەوە رووخا بوو و ژمارەی دانیشتوانەکەی، کەم. بوورج و دیوارەکەی دروست کردەوە و ناوی نا مەعمورە (ئاوەدان) و بناغەی مزگەوتی هەینی داڕشت. لەم شارەدا بەخششی مانگانە یا ساڵانە بۆ خەڵکان دیاری کرد و کەسانێکی زۆر لەخەڵکەکەی خۆی، لەو شارەدا نیشتەجێ کرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: سەعد کوڕی ئیسحاق کوڕی کەعبی کوڕی عەجرە، عەمرۆ کوڕی یەحیا کوڕی ئەبی حەسەنی ئەنساری، عەمارە کوڕی غەزیەی ئەنساری، باوەکی عەلا، ئەییووبی قەساب، باوکی جەعفەر، محەممەد کوڕی عەبدوالله ئیسکافی لەشارەزایانی موعتەزیلە و یەکێك لەرێبەرەکانی ئەوان، ئەسماء کوڕی عوبەید کوڕی موخاریق باوکی حویزە کوڕی ئەسماء.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و یەکی کۆچی (( ٧٥٨- ٧٥٩ زایینی )

## شۆڕشی ڕاوەندییەکان

لەم ساڵەدا ڕاوەندییەکان دژی مەنسور ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە. ئەوان خەڵکانی خوراسان بوون و باوەڕیان بەباوەڕەکانی ئەبوموسلیم(سەرکردەی بانگەشەکەرانی عەباسی) بوو. باوەڕیان بەجێگۆڕکێی گیان (گواستنەوەی ڕۆح لەجەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی دیکە) و گوومانیان دەکرد ڕۆحی ئادەم گەشتۆتە جەستەی عوسمان کوڕی نەهیك و خواوەند، کەرۆژی و خواردنیان پێدەگەنێت، ئەبووجەعفەری مەنسور، سەروەری باوەڕداران و پشتیوانی هەژارەکانە و جبرائیل هەمان هەیسەم کوڕی معاویەیە.

کاتێك دەرکەوتن، ڕوویان کردە کۆشکی مەنسور و وتیان: ئەمە کۆشکی پەروەردگاری ئێمەیە. مەنسور سەرکردەکانی ئەوانی لەگەڵ دووسەد کەسیتر خستە زیندانەوە. هاوەڵانیان تووڕە بوون و لاشەی مردووێکیان خستە سەرشان و تەختیان هەڵگرت (بێ ئەوەی کەسی لەسەر بێت) بەرێکەوتن تا گەیشتنە بەردەم دەرگای زیندان، لاشەی مردووەکەیان فرێدا و هێرشیان کردە سەر زیندانەکە و هاوەڵانی خۆیان ئازاد کرد و دواتر بەرەو کۆشکی مەنسور بەرێکەوتن. ژمارەیان لەو ڕۆژەدا شەشسەد کەس بوو. خەڵك جاڕیاندا و دەروازەکانی شارەکە داخرا و کەس نەیتوانی بڕواتە ناو شارەکە. مەنسور بەپێی پیادە لەکۆشکەکەی هاتەدەر چوونکە هیچ چوارپێیەکی لێ نەبوو. لەوە بەدوا، بەردەوام ئەسپەکەی خۆی لەناو کۆشکدا دەبەستەوە.

کاتێك مەنسور هاتەدەر، ئەسپیان بۆ هێنا و بەسواری، بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت. بەئەندازەیەك لەدەوری کۆبووونەوە ئەوەندەی نەمابوو بیکوژن. مەعن کوڕی زایدەی شەیبانی کە لەترسی مەنسور بەشێوەیەکی شاراوە ژیانی بەسەر دەبرد (چوونکە هاوڕێ لەگەڵ کوڕی هوبەیرە جەنگا بوو) هات. پێشتر ئامازەمان پێدا. مەنسور بەشێوەیەکی جیدی بەدوایدا دەگەڕا و سامانێکی زۆری بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردبوو. کاتێك ئەم ڕووداوە هاتە پێش. دەمامکی لەروخسار بەست و ڕۆشتە لای مەنسور. دابەزی و ئازایانە شەڕی کرد و ئەزمونێکی جوانی لەخۆی بەجێهێشت. مەنسور سوار لەسەر ئێسترێك بوو کەهەوسارەکەی بەدەستی ڕەبیعی دەرگاواندا بوو. مەعن هات و وتی: بڕۆ ئەو لاوە من بۆ گرتنی ئەم هەوسارە لەتۆ شیاوترم. مەنسور وتی: ڕاست دەکات، هەوسارەکە بەو بسپێرە. بەردەوام

شەڕی کرد تا ئەو کاتەی شەر لەبەرژەوەندی مەنسور کۆتایی هات. لەم کاتەدا مەنسور پێی وت: کێیت؟ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەڵاتوو لەتۆ مەعن کوڕی زایدەم. وتی: خواوەند بۆ سامان و بنەماڵەکەی خۆت بتهێڵێت، کەسێکی وەك تۆ دەبێت پەروەردە بکرێت و ڕێزی لێ بگیرێت.

باوکی نەسر مالك کوڕی هەیسەم هات و لەبەردەم دەرگای کۆشکەکەی مەنسور وەستا و وتی: ئەمڕۆ من دەرگاوانم. لەم کاتەدا خەڵکانی بازار هاواریان کرد و تیربارانیان کردن و ڕووبەڕوویان بوونەوە. دەروازەی شارەکە کرایەوە و خەڵك ڕۆشتنە ناو شارەکە. خازم کوڕی خەزیمە هات و هێرشی کردە سەرئەوان تا بۆ پەنای دیوارەکان، پاشەکشێی پێکردن. دووبارە هێرشی برد و ئەوەندەی دیکە دووری خستنەوە. خازم بەهەیسەم کوڕی شوعبەی وت: کاتێك هێرشیان کردە سەر ئێمە، پێش ئەوان خۆت بەدیوارەکە بگەیێنەو لەکاتی گەڕانەوە، کوشتاریان بکە. ئەوان هێرشیان کردە سەرخازم. ئەو، خۆڕاگری کرد و پاشەکشێی پێکردن. هەیسەم لەپشتەوە هێرشی کردە سەریان و بەم شێوەیە هەموویان کوژران.

لەم ڕۆژەدا عوسمان کوڕی نەهیك هاتە لای ئەوان و ئامۆژگاری کردن. بەڵام لەکاتی گەڕانەوە تیرێکی بەرکەوت. چەند ڕۆژێك لەجێگەدا کەوت و دوای ئەوەی، مرد. مەنسور نوێژی لەسەر خوێند و دوای ئەو، عیسا کوڕی نەهیکی کردە سەرکردەی پاسەوانەکانی. عیسا فەرماندەی پاسەوانەکان بوو تا ئەو کاتەی ماڵئاوایی لەجیهان کرد. دوای ئەو، باوکی عەباسی تووسی، فەرماندەیی پاسەوانەکانی گرتەدەست. هەمووی ئەم ڕووداوانە لەشاری هاشمییەی کوفە ڕوویاندا.

کاتێك مەنسور نوێژی نیمەڕۆی خوێند، فەرمانیدا و نانیان هێنا. مەعنی بانگ کرد و پێگەی ئەوی بەرز کردەوە و بەمامەکەی عیسا کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی وت: ئەی باوکی عەباس، تا ئێستا ناوبانگی بوێرترینی خەڵکانت بینیوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەگەر ئەمڕۆ مەعنت دەبینی، بێ گومان دەتزانی ئەو، یەکێکە لەوان. مەعن وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کاتێك هاتمە لای تۆ، دەترسام و دەلەرزام. کاتێك بینیم بەمشێوەیە بوێری لەخۆت نیشاندەدەیت و هێرشیان دەکەیتە سەر، شتێکم بینی کەهیچ کات لەهیچ جەنگێکدا نەمبینیبوو. ئەم کارە، وەرەی پێبەخشیم و بۆ ئەو کارە ناچاری کردم کەخۆت بینیت.

دەستەیەك دەڵێن: مەعن دوور لەچاوی مەنسور ژیانی بەسەردەبرد چوونکە هاوڕێ

لەگەڵ کوڕی هوبەیرە، شەڕی کردبوو. شوێنی خۆحەشاردانی لای باوکی خەسیب، دەرگاوانەکەی مەنسور بوو. باوکی خەسیب هەوڵیدەدا ئەمانی بۆ وەربگرێت. کاتێك ڕاوەندییەکان شۆڕشیان دەستپێکرد، مەعن هاتە و لەبەردەم دەرگای کۆشکدا وەستا. مەنسور لەباوکی خەسیبی پرسی: چ کەسێك لەبەردەم دەرگای کۆشکە؟ وتی: مەعن کوڕی زایدە. مەنسور وتی: پیاوێکە عەرەب نەژاد، بووێر، شارەزا لەکاروباری جەنگ، خاوەن بنەماڵەیەکی گەورە، بیهێنە بۆ لای من. کاتێك هات، مەنسور وتی: ئەی مەعن، دەبێت چی بکەین؟ مەعن وتی: بۆچوونی ڕاست ئەوەیە خەڵك کۆبکەیتەوە و سامانیان لەناودا دابەش بکەیت. مەنسور وتی: کوا خەڵکان؟ کوا سامان؟ چ کەسێك دەتوانێت ڕووبەڕووی ئەم یاخییانە ببێتەوە؟ هیچ کارێکت نەکردووە مەعن! بۆچوونی ڕاست ئەوەیە بڕۆمەدەرو خۆم نیشانی خەڵکان بدەم. کاتێك من ببینن دەگەڕێنەوە و شەڕ دەستپێدەکەن. بەڵام ئەگەر بمێنمەوە، سستی لەخۆیان نیشان دەدەن و چیتر هاوکاریمان ناکەن. مەعن دەستی ئەوی گرت و وتی: نا، ئەی سەروەری باوەڕداران، لەئێستادا ئەو کارە مەکە، چوونکە دەکوژرێیت. سوێندت دەدەم بەخوا گیانی خۆت نەخەیتە مەترسییەوە. باوکی خەسیبیش بۆچوونەکەی ئەوی پشتراست کردەوە. مەنسور داوێنی لەدەستی ئەو دووانە دەرهێنا و سوار ئێسترەکەی خۆی بوو و ڕۆشتەدەر. مەعن جڵەوی چاروێکەی گرت و باوکی خەسیب و پاسەوانەکانی، پارێزگاریان لێدەکرد. پیاوێك هاتە پێش، مەعن ئەوی کوشت و بەمشێوەیە چوارکەسی لەناو برد. خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە و زۆری نەخایاند، ئەوانیان لەناوبرد. دواتر مەعن هەڵات و خۆی شاردەوە. مەنسور بەردەوام پرسیاری ئەوی لەباوکی خەسیب دەکرد. وتی: شوێنەکەی نازانم. وتی: دوای ئەم هەموو جوامێرییە، گومانی دەکرد لەگوناحەکەی خۆش نابم؟ ئەمانی پێببەخشە و بیهێنە بۆ لای من. باوکی خەسیب ئەوی نیشاندا. مەنسور فەرمانیدا و دە هەزار درهەمیان پێبەخشی. دواتر ئەوی وەك فەرمانداری یەمەن دەستنیشان کرد.

## لەسەرکارلابرانی عەبد جەبار لەخوراسان

بەرێکەوتنی مەهدی بۆ شەڕی ئەو

لەم ساڵەدا عەبدجەبار کوڕی عەبدولرەحمان کارگوزاری مەنسور لەخوراسان، لەسەر کارەکەی لابرا.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کە: کاتێك مەنسور ئەوی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کرد، مەبەستی کوشتنی فەرماندەکانی کرد. دەستەیەك لەوانی کوشت و دەستەیەك لەوانی خستە زیندانەوە. ئەم هەواڵە بەمەنسور گەیشت لەگەڵ نامەیەك کەتیایدا نووسرا بوو: پێست بەرەو ڕزان و داوەشین دەڕوات. مەنسور بەباوکی ئەییووبی وت: ئەو شیعەکانی ئێمەی لەناو بردووە، مەبەستی لەم کارە تەنیا شۆڕش کردنەوە. باوکی ئەییووب وتی: نامەی بۆ بنووسە و پێی بڵێ کەمەبەستی شەڕ لەگەڵ ڕۆمییەکانت هەیە و ئەو دەبێت سوپای خوراسان و فەرماندەکان ڕەوانە بکات. کاتێك سوپاییەکان هاتنەدەر، هەرکەس دەخوازێت وەك فەرماندار بۆ ئەو دیارە ڕەوانە بکە چوونکە کەس ناتوانێت لەبەرابەر ئەم کارە بەرگری بکات.

مەنسور نامەیەکی لەمشێوەی بۆ عەبدجەبار نووسی. وەڵامی دایەوە: تورکەکان سەرقاڵی جموجۆڵن. دەترسم ئەگەر سوپاکە ڕەوانە بکەم، خوراسانمان لەدەست بڕوات. مەنسور نامەکەی نیشانی باوکی ئەییووبدا و وتی: چی دەبینیت؟ وتی: دەستی تۆی بۆ سەر خۆی ئاوەڵا کردووە. نامەی بۆ بنووسە: خوراسان بۆ من لەشوێنەکانی دیکە گرنگترە و من سوپا بۆ تۆ ڕەوانە دەکەم. دواتر سوپاییەکان ڕەوانە بکە تا لەخوراسان بمێننەوە بۆ ئەوەی ئەگەر مەبەستی نافەرمانی کرد، بتوانن سەرکوتی بکەن.

کاتێك پەیك و پەیامی مەنسور گەیشتە لای عەبدجەبار، وەڵامی دایەوە: هیچ کات خوراسان بەئەندازەی ئەم ساڵە، بارودۆخی شڵەژاو نەبووە، ئەگەر سوپاییەکان بێنە ئەم شارە، گیرۆدەی وشکەساڵی و قاتوقڕی دەبن. کاتێك نامەکەی بەدەستی مەنسور گەیشت، نیشانی باوکی ئەییووبیدا کەوتی: مەبەستی شەڕکردنی هەیە، دەرفەتی پێمەدە.

مەنسور، مەهدی کوڕی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو، ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەشاری ڕەی نیشتەجێ ببێت. مەهدی بەرێکەوت و پێش خۆی، خازم کوڕی خەزیمەی بۆ شەڕی عەبدجەبار، نارد. خۆی بەرێکەوت و لەنەیشابوور دابەزی. کاتێك ئەم هەواڵە بەخەڵکانی

مەروروود گەیشت، بۆ شەڕی عەبدجەبار، بەرێکەوتن و ئازایانە، شەڕیان لەگەڵ کرد. عەبدجەبار هەڵات و لەقەڵاگەی خۆی، خۆی حەشاردا. موجەشەر کوڕی موزاحیم بەرەو لای ئەو بەرێکەوت. (ئەو، لەخەڵکانی مەرورود بوو) ئەوی ئەسیر کرد و ڕۆشتە لای خازم و تەسلیمی کرد. خازم پێستەیەکی وشتری لەبەر کرد، سوار وشتری کرد بەشێوەیەك رووی لەقوونی وشترەکە بوو و بەم شێوەیە لەگەڵ کەسانی بنەماڵەکەی بۆ لای مەنسور، بەرێیکرد. مەنسور، ئەشکەنجەی کرد و سامانەکانی لێوەرگرتنەوە. دواتر فەرمانیدا و هەردوو دەست و قاچی عەبدجەباریان بڕییەوە و کوشتیان. کەسانی بنەماڵەکەیان بۆدوورگەیەکی یەمەن ڕەوانە کرد. لەوێ بوون تا ئەو کاتەی هیندییەکان هێرشیان کردە سەریان و هەموویان ئەسیر کران. دواتر، عەرەبەکان بەهای ئازادی ئەوانیاندا و ئازادیان کرد. یەکێك لەئازادبووەکان عەبدولرەحمان کوڕی عەبدجەبار (هاوڕێی نزیکی خەلیفەکانی عەباسی) بوو کە لەساڵی ١٧٠/ ٧٨٦ زایینی لەرۆژگاری هارون ئەلرەشید، مرد.

دەستەیەك دەڵێن: بەسەرهاتی عەبدجەبار لەمانگی رەبیع الاوەلی ١٤٢/ ژوئیەی ٧٥٩ زایینی یا ١٤٠/ ٧٥٧ زایینی روویدا.

## گرتنی تەبەرستان

کاتێك مەهدی بەسەر عەبدجەباردا سەرکەوت و رووبەرووی هیچ گرفتارییەك نەبوویەوە، مەنسور پەسەندی نەکرد ئەو هەموو هەزینەی بۆ مەهدی تەرخانی کردبوو، بەفیرۆ بڕوات. نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر تەبەرستان و لەشاری رەی، دابەزێت و باوکی خەسیب و خازم و سوپاییەکان بۆ شەڕی سوپاسالاری ڕەوانە بکات کە لەو کاتەدا سەرقاڵی شەڕ کردن بوو لەگەڵ مەسمەغان، پاشای دۆنباوەند. کاتێك بیستی کەسوپاییەکان هێرشیان کرۆدتە سەر وڵاتەکەی و باوکی خەسیب، ڕۆشتۆتە ناو سارییە (ساری) مەسمەغان بەسوپاسالاری وت: ئەگەر تۆ سەرکوت بکەن، هێرش دەکەنە سەرمن. ئەم دووانە بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسوڵمانەکان، یەکیان گرت. سوپاسالار بۆ وڵاتەکەی خۆی گەڕایەوە و شەڕی لەگەڵ موسوڵمانەکان دەستپێکرد. شەڕ درێژەی کێشا و مەنسور، عومەر کوڕی عەلای بۆ تەبەرستان نارد. بەشار سەبارەت بەعومەر وتی:

اذا ایقظتك حروب العدی      فنبه لها عمرا ثم نم

یانی: کاتێك شەڕی دوژمنان، خەویان لەچاوی تۆ رفاند، عومەر کوڕی عەلا بۆ شەڕ

ڕەوانە بکە و دواتر ئارام و ئاسوودە، بخەوە.

ئەو، کارگوزاری تەبەرستان بوو. سوپاکەی هەڵگرت و بەڕێکەوت و مەبەستی هێرش کردنە سەر رووپانی کرد. دەستی بەسەردا گرت و قەڵای تاقی گرت و هەموو سامانەکانی بەتاڵانی برد. شەڕ درێژەی کێشا و خازم پێداگری لەشەڕەکە کرد و دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرت و خەڵکەکەی کوشتار و کوشتنی لەئەندازە تێپەڕاند. سوپاسالار ڕۆشتە ناو قەڵاکەی خۆی و داوای ئەمانی کرد لەسەر ئەو بنەمای قەڵاکە و هەموو سامانەکان، تەسلیم بەعەرەبەکان بکات. مەهدی نامەی بۆ مەنسور نووسی و ئاگاداری کردەوە. مەنسور، ساڵح (فەرمانداری موسەللای) ڕەوانە کرد. ئەوان، سامانەکانی قەڵاکەیان کۆکردەوە و گەڕانەوە. سوپاسالار ڕۆشتە ناو گیلان لەنزیك دیلمان و لەوێ مرد. کچەکەیان ئەسیر کرد کەدواتر بوو بەدایکی ئیبراهیم کوڕی عەباس کوڕی محەممەد. سوپای موسوڵمانان مەبەستی هێرش کردنە سەر مەسمەغانیان کرد. دەستیان بەسەرداگرت و بەسەر بەحتەرییەکان، سەرکەوتن و بەحتەرییە (دایکی مەنسور کوڕی مەهدیان) بەدەستهێنا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا زیاد کوڕی عەبدوڵڵا، فەرمانداری مەککە و مەدینە و تایفی لێسەندرایەوە و لەمانگی ڕەجەب، نۆڤەمبەری ٧٥٩ زایینی، محەممەد کوڕی خالید کوڕی عەبدوڵڵای قەسری وەك فەرمانداری مەدینە، دەستنیشان کرا. فەرمانداری مەککە و تایف، هەیسەم کوڕی معاویەی عەتکی (لەخەڵکانی خوراسان) بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: موسا کوڕی کەعب سەرکردەی پاسەوانەکانی مەنسور، (کارکوزاری هیند و میسر کەجێگرەکەی لەهیند کوڕەکەی عۆیەیینە بوو چوونکە موسا ئەوی لەفەرمانڕەوایەتی کردنی میسر دوورخستەوە و محەممەد کوڕی ئەشعەسی بۆ ئەو کارە ڕاسپارد، دواتر ئەو لەسەر کار لابرا و نەوفل کوڕی محەممەد کوڕی فورات هاتەسەر کار). سەعید کوڕی سەعید برای یەحیا کوڕی سەعیدی ئەنساری و ئەبان کوڕی تەغلەب، قورئان خوێنی بەناوبانگ.

ساڵح کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵا فەرمانداری شام، لەم ساڵەدا ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. فەرمانداری کوفە، عیسا کوڕی موسا، بەسرە، سوفیان کوڕی معاویە، خوراسان لەژێر دەستی مەهدیدا بوو (جێگرەکەی لەو شارە، سەری کوڕی عەبدوڵڵا ) و فەرمانڕەوایەتی موسڵ لەدەستی ئیسماعیل کوڕی عەلی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و دووی کۆچی (( ٧٥٩ زایینی ))
## نافەرمانی عۆیەیینە کوڕی موسا کوڕی کەعب

لەم ساڵەدا عۆیەیینە کوڕی موسا کارگوزاری سند، لەو ناوچەیە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە.

هۆکاری نافەرمانی کردنی ئەوە بوو کەباوکی، موسەییب کوڕی زوهەیری وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی دەستنیشان کرد. کاتێك موسا کوڕی ئەزیر مرد، موسەییبی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی هەڵبژارد. لەوە ترسا مەنسور، عۆیەیینە بانگ بکات و سنوری فەرمانڕەوایەتی باوکی بەو بسپێرێت. لەبەر ئەمە دێڕێك هۆنراوەی نووسی و بێ واژۆ، نامەکەی خۆی ڕەوانە کرد:

فارضك ارضك ان تأتنا        تنم نومة ليس فيها حلم

یانی: لەسەرزەمینەکەی خۆت بمێنەرەوە چوونکە ئەگەر بێیتە لای ئێمە، لەخەوێکدا ڕۆدەچیت کەچیتر هیچ لەخەودا نابینیت و هیچ کات بەئاگا نایێتەوە.

لەبەر ئەمە نافەرمانی دەست پێکرد.

کاتێك مەنسور ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت تا لەسەر پردی بەسرە دابەزی و عومەر کوڕی حەفس کوڕی ئەبی سەفرەیی عەتکی وەك کارگوزاری سند و هیند، ڕەوانە کرد.

عۆیەیینە ڕووبەڕووی بوویەوە بەڵام ئەو درێژەی بەرێگای خۆیدا تا گەیشتە سەند و دەستی بەسەردا گرت.

## پەیمان شکێنی سوپاسالار

لەم ساڵەدا سوپاسالاری تەبەرستان، پەیمانەکەی خۆی خستە ژێرپێ و ئەو موسوڵمانانەی کوشتار کرد کە لەوڵاتەکەی ئەو، ژیانیان بەسەر دەبرد. کاتێك ئەم هەواڵە بەمەنسور گەیشت، کۆیلەکەی باوکی خەسیب و خازم کوڕی خەزیمە و ڕوەح کوڕی حاتەمی بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کرد.

ئەوان، لەدەوری قەلاکەی ئەو دابەزین و گەمارۆیان خستەسەر. ئەو لەقەلاکەیدا بوو. کاتێك مانەوەی ئەوان درێژەی کێشا، باوکی خەسیب رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و بەهاوەلانی خۆی وت: لەمن بدەن و سەروریشم بتاشن. ئەو کارەیان لەگەڵ کرد. باوکی خەسیب، پەیوەستی سوپاسالار بوو و پێی وت: بووختانیان بۆ من دروست کرد و پێیان وتم کەلایەنگیری لەتۆ دەکەم. پێی وت: چیتر پەیوەستی تۆ دەبەم ورێگەی زیان گەیاندن بەموسوڵمانانت نیشان دەدەم. سوپاسالاری رازی و ئەوی کردە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆی و چاکەی لەگەڵدا کرد.

دەروازەی قەلاکەی ئەوان، بەردێکی گەورە و قورس بوو کە لەکاتی بەستن، دەکەوتە خوار. پیاوە بەهێزەکان بەرزیان دەکردە و دواتر دایاندەگرت و بەمشێوەیە دەرگاکەیان ئاوەلا و دادەخست. سوپاسالار کەسە نزیکەکانی خۆی بۆ ئەو کارە راسپاردبوو. کاتێك سوپاسالار، پشتی بەباوکی خەسیب بەست، ئەوی بۆ کردنەوە و بەستنی دەوازەکە، راسپارد.

باوکی خەسیب نامەی بۆ خازم و روەح نووسی و بەتیرێك بۆ ئەوانی رەوانە کرد. ئاگاداری کردنەوە کەرێگە چارەی دۆزیوەتەوە. شەوێکیان هەڵبژارد تا دەروازەکەیان بۆ بکاتەوە. کاتێك شەوی دیاریکراو گەیشت، دەروازەکەی بەرووی ئەواندا کردەوە کەرۆشتنە ناو شارەکە و شەرکەرانیان کوشتار و ژن و منالەکانیان ئەسیر کرد. شەکلە دایکی ئیبراهیم کوری مەهدیان هەڵبژارد و بەمەهدییان بەخشی. سوپاسالار جامێك ژەهری خواردەوە و بێدرەنگ، گیانی سپارد.

دەستەیەك دەڵێن: ئەم رووداوە لەساڵی ١٤٣/ ٧٦٠ زایینی، روویدا.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا لەمانگی جەمادی الثانی/ ئۆکتۆبەری ٧٥٩ زایینی، سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، فەرمانداری بەسرە، لەتەمەنی ٥٩ ساڵی، چاوی لەجیهان بەست و براکەی عەبد سەمەد، نوێژی لەسەر خوێند.

هەروەها لەم ساڵەدا، نەوفل کوڕی فوراتیان لەفەرمانڕەوایەتی میسر دوورخستەوە و حەمید کوڕی قەحتەبەیان لەجێگەی ئەودانا.

ئایینی حەج لەم ساڵەدا لەلایەن ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله، ئەنجامدرا. کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

مەنسور، براکەی عەباس کوڕی محەممەدی وەك فەرمانڕەوای جەزیرە، عواصم (پایتەختەکان؟ یا شوێنێك بەناوی عواصم؟) و سنورەکان دەستنیشان کرد و مامەکەی، ئیسماعیل کوڕی عەلی لەموسڵ لابرد و مالك کوڕی هەیسەمی خوزاعی باوەگەوریی ئەحمەد کوڕی نەسیری (کە بەدەستی واسق کوژرا) بۆ ئەو کارە راسپارد. یەکێك بوو لەباشترینی فەرماندارەکان.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: باوکی سەعید یەحیا کوڕی سەعیدی ئەنساری دادیاری مەدینە کەدەستەیەك مەرگی ئەو بۆ ساڵی ١٤٣ یا ١٤٤/ ٧٦٠ یا ٧٦١ زایینی، دەگێڕنەوە. موسا کوڕی عوقبە موالی بنەماڵەی زوبەیر، عاسم کوڕی سلێمان (ئەحول) کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٤٣/ ٧٦٠ زایینی کۆچی دوایی کرد. حەمید کوڕی ئەبی حەمیدی تەرخان (یا: مێهران) موالی تەڵحە کوڕی عەبدوallaهی خوزاعی ناسراو بەناوی (حەمیدە درێژ) کە حەدیست لەئەنس و مالك دەگێڕێتەوە. ساڵەکانی ژیانی ٧٥ ساڵ، درێژەی کێشا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و سێی کۆچی (( ٧٦٠ زایینی ))

لەم ساڵەدا دەیلەمییەکان دژی موسوڵمانان شۆڕشیان کرد و بەتەواوی کوشتاریان کردن. ئەم هەواڵە بەمەنسور گەیشت و خەڵکانی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان هاندا.

لەم ساڵەدا هەیسەم کوڕی معاویەیان لەفەرمانڕەوایەتی تاییف و مەککە دوورخستەوە و سەری کوڕی عەبدوڵلە کوڕی حارس کوڕی عەباسیان لەجێگەی ئەودانا کەفەرمانداری یەمامە بوو. ئەو، بەرەو مەککە بەڕێکەوت.

مەنسور، خەسم کوڕی عەباس کوڕی عەبدوڵلەی وەك فەرمانداری یەمامە دەستنیشان کرد. هەروەها لەم ساڵەدا حەمید کوڕی قەحتەبەیان لەفەمانڕەوایەتی کردنی میسر دوورخستەوە نەوفل کوڕی فوراتیان لەجێگەی ئەودانا. دواتر نەوفلیان لابرد و یەزید کوڕی حاتەمیان لەجێگەی ئەودانا.

عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلە کوڕی عەباس، لەم ساڵەدا ئاینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو فەرمانداری کوفە بوو.

لەم ساڵەدا رزق کوڕی نەعمانی غەسانی لەئاندۆلۆس، دژی عەبدولرەحمان شۆڕشی کرد. ئەو، فەرمانداری (دوورگەی خەزرا، سەوز لەئیسپانیا) بوو. دەستەیەك لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و ڕۆشتە ناو شەزونە و دەستی بەسەردا گرت و دواتر رووی کردە شاری سومیل. عەبدولرەحمان، لەو شارە گەمارۆی خستە سەر و زەختی لەخەڵکەکەی کرد. خەڵکان، خۆیان لەو نزیك کردەوە و رزقیان تەسلیم کرد. عەبدولرەحمان، رزقی کوشت و ئەمانی بەخەڵکان بەخشی و بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی عەتا فەرمانڕەوای شارعە ( ناوی دارستانێکی خورمای تایبەت)، سلێمان کوڕی تەرخانی تیمی (تەمیمی)، ئەشعەس کوڕی سەوار و موجالید کوڕی سەعید،ماڵئاواییان لەجیهان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و چواری کۆچی (( ٧٦١ زایینی ))

لەم ساڵەدا باوکی جەعفەر، شەڕکەرانی لەکوفە و بەسرە، موسڵ و جەزیرە بۆ شەڕ لەگەڵ دەیلەمییەکان ڕەوانە و محەممەد کوڕی ئەبی عەباسی وەك فەرماندەی ئەوان، دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەهدی لەخوراسانەوە گەڕایەوە بۆ عێراق و یەکەم شەوی هاوسەرگیری خۆی لەباوەشی ئەیتە، کچی مامەکەی، سەفاح، بەسەر برد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور، حەجی کرد و خازم کوڕی خەزیمەی وەك سەرپەرەستی کاروباری سوپا، دەستنیشان کرد.

## دانانی ریاح کوڕی عوسمانی موری لەمەدینە

بەسەرهاتی محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور، ریاح کوڕی عوسمانی موری وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان کرد و محەممەد کوڕی خالید کوڕی عەبدوالله‌ی قەسری، لابرد.

هۆکاری دوورخستنەوەی ئەو (و لەسەر کار لابردنی زیاد پێش ئەو) ئەمە بوو: مەنسور لەبەهێزی و توانایی محەممەد و ئیبراهیم، دوو کوڕەکەی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، ترسا و پەرێشان بوو چوونکە ئەم دووانە لەساڵی ١٣٦/ ٧٥٤ زایینی لەکاتی حەج کردنی سەفاح، لەهاتن بۆ لای ئەو، خۆیان بەدوور گرت. وتوویانە: محەممەد کوڕی عەبدوالله دەیوت: لەو شەوەی (بەدوای تێکچوونی بارودۆخی وڵاتەکەی مەروان کوڕی محەممەد) هاشمییەکان لەکوفە بۆ راوێژ کردن کۆبوونەوە تا خەلیفەی داهاتوو هەڵبژێرن، مەنسور بەیعەتی لەگەڵ من کرد و منی وەك سەروەری باوەڕداران ناساند. کاتێك مەنسور لەساڵی ١٣٦/ ٧٥٤ زایینی، حەجی کرد، پرسیاری ئەم دووانەی کرد. زیاد کوڕی عەبدوالله‌ی حارسی پێی وت: بۆ نەهاتنی ئەم دووانە تۆی هەراسان کردووە؟ من دەیانهێنمە لای تۆ. ئەو لەمەککە بوو و مەنسور ئەوی بۆ مەدینە گەڕاندەوە.

کاتێك مەنسور لەسەر تەخت دانیشت، هەوڵیدا شوێنپێی کارەکانی محەممەد هەڵبگرێت. بەردەوام سەبارەت بەو و کارەکانی پرسیاری دەکرد. یەك یەك هاشمییەکانی بانگ کرد و بەشێوەیەکی نهێنی لێکۆڵینەوەی دەکرد. هەموویان وتیان: ئەو دەزانێت تۆ گومانی ئەوەی

لێدەکەیت کەچاوی بڕیبێتە فەرمانڕەوایەتی و خەلافەت، لەبەر ئەمە لەگیانی خۆی دەترسێت بەڵام خوازیاری شەڕ کردن لەگەڵ تۆ نییە. بەڵام حەسەن کوڕی زەید کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب پێی وت: سوێند بەخوا ئاسوودە نیم و دڵنیام دژی تۆ، ئاڵای شۆڕش بەرز دەکاتەوە و لەناوت دەبات چوونکە بەردەوام بەدوای دەرفەتێکی گونجاودا دەگەڕێت. بەم وتەی، ئەو کەسی بەئاگا بوو، بێداری کرد. لەمەدوا موسا کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە، داوای خوێنی ئێمە لەحەسەن کوڕی زەید بکە.

لەو ساڵەی مەنسور حەجی کرد، زەختی لەعەبدوالله کوڕی حەسەن کرد تا کوڕەکەی بباتە لای مەنسور. عەبدوالله بەسلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی وت: ئەی براکەم، لەنێوان ئێمە و ئێوە پەیوەندی خزمایەتی و ژن و ژنخوازی هەیە کەلێی ئاگاداریت؟ چی لەم کارەدا دەبینیت؟ سلێمان وتی: لەئێستاوە بیری دێنەوە و ئەو ڕۆژەم لەبەرچاوە کەبراکەم عەبدوالله کوڕی عەلی لەکاتی دروست بوونی پەردە لەنێوان ئێمە و خۆی، پەنجەی بۆ لای ئێمە درێژ کرد و وتی: ئێوە ئەم بەڵاتان بەسەر هێنام. ئەگەر ئەم پیاوە (مەنسور) بەخشندە دەبوو، مامەکەی خۆی دەبەخشی. عەبدوالله بۆچوونەکەی سلێمانی پەسەند کرد و زانی کەراست دەکات. لەبەر ئەمە لەئاشکرا کردنی کوڕەکەی، خۆی پاراست.

مەنسور چەندین کۆیلەی لەکۆیلەی عەرەبەکانی کڕی و بەهەرکام وشترێك و کەل و پەلی پێویستی بەخشی و ئەوانی بۆ دۆزینەوە محەممەد، ڕەوانە کرد تا لەدەرەوەی مەدینە شوێنپێی هەڵبگرن. هەرکام لەوان هاوشێوەی ڕێبووارێکی ڕێ ونر کردو، لەسەر ئاوێك دادەبەزی و سەبارەت بەمحەممەد پرسیاری دەکرد. مەنسور سیخوڕێکی دیکەی ڕەوانە و بەودا نامەیەکی لەزمانی شیعەکانەوە بۆ محەممەد نارد کەدەیانوت: فەرمانبەرو گوێرایەڵی فەرمانەکانی تۆین. زێر و گەنجی گرانبایی بۆ نارد. پیاوێك هاتە مەدینە و ڕۆشتە ماڵی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن و سەبارەت بەمحەممەدی کوڕی پرسیاری کرد. کارەکەی خۆی بەنهێنی هێشتەوە. پیاوەکە چەندین جار ڕۆشتە ماڵەکەی و پرسیاری شوێن و مەکانی ئەوی کرد. پێی وت: لای عەلی کوڕی پیاوی چاکەکار کە بە(ناوچاو سپی) بەناوبانگە، تێپەڕ تا لەشوێنی خۆ حەشاردانی محەممەد ئاگادارت بکاتەوە.

مەنسور دەبیرێکی شیعەی ڕازداری بوو. بەشێوەیەکی نهێنی نامەی بۆ عەبدوالله کوڕی حەسەن نووسی و لەکاری سیخوڕەکە ئاگاداری کردەوە. کاتێك نامەکەی گەیشت، ترسان و

باوکی هەباریان بۆ لای محەممەد و عەلی کوڕی حەسەن ڕەوانە و ئاگاداریان کردنەوە. باوکی هەبار بەڕێکەوت و لای عەلی کوڕی حەسەن دابەزی و ئاگاداری کردەوە. دواتر ڕۆشتە شوێنی خۆ حەشاردانی محەممەد و بینی لەناو ئەشکەوتێك لەگەڵ هاوەڵانی خۆی دانیشتوە و سیخوڕەکە لەناو ئەواندایە کەدەنگی لەهەموان دلێرترە. کاتێك باوکی هەباری بینی، ترسا. باوکی هەبار بەمحەممەدی وت: کارێکم بەتۆیە. محەممەد هەستا و ئەو دووانە لەئەشکەوتەکە هاتنەدەر. باوکی هەبار لەبارودۆخ ئاگاداری کردەوە. وتی: دەبێت چی بکەین؟ وتی: یەکێك لەم سێ کارە. وتی: چی؟ وتی: ڕێگە بدە ئەم پیاوە بکوژم. وتی: تەنیا لەکاتی زۆر، دەستم بەخوێنی کەسێك پیس دەکەم. وتی: بەزنجیر دەست و پێی ببەستەوە و بۆ کوێ دەخوازیت برۆ .و لەگەڵ خۆت ببیە. وتی: ئایا بەم پەلەپەلە دەتوانین رابکەین؟ وتی: دەیبەستینەوە و تەسلیمی خەڵکەکەی تۆی دەکەین لەجۆهەینە. ئەم بۆچوونەی پەسەند کرد.

ئەم دووانە گەڕانەوە ناو ئەشکەوتەکە، بەڵام پیاوەکەیان نەبینی. محەممەد وتی: ئەو پیاوە لەکوێیە؟ وتیان: گۆزەیەك ئاوی هەڵگرت و ڕۆشت تا دەستنوێژ بگرێت. بەدوایدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە. محەممەد پیادە بەڕێکەوت تا گەیشتە سەر ڕێگەکە. دەستەیەك لەعەرەبە بیابانگەڕەکان کەباریان بۆ مەدینە دەبرد، لای ئەو تێپەڕین. محەممەد بەیەکێك لەوانی وت: بارەکەت خاڵی بکە و منی تیا حەشار بدە و بمبە بۆ ناو مەدینە تا پاداشتت پێ ببەخشم. پیاوەکە ئەو کارەی کرد و ئەوی گەیاندە مەدینە و پاداشتی خۆی وەرگرت.

دواتر ئەو پیاوە، ڕۆشتە لای مەنسور و ئاگاداری کردەوە بەڵام ناوی باوکی هەبار و نازناوەکەی ئەوی لەبیر کرد و وتی: وەبار. باوکی جەعفەر کەسانێکی بۆ گرتنی وەباری موری ڕەوانە کرد. پیاوێکیان بەناوی وەبر بردە لای ئەو. داستانی محەممەدیان لێپرسی و پیاوەکە سوێندی خوارد کەئاگای لەو بابەتە نییە. مەنسور فەرمانیدا حەوتسەد قامچی لێبدەن. دواتر زیندانیان کرد و لەوێ مایەوە تا مرد.

مەنسور، عوقبە کوڕی ئەسلەمی ئەزدی بانگ کرد و پێی وت: بۆ مەبەستێکم تۆم دەوێت کەبەتەواوی نیگەرانی کردووم بۆیە بەدوای کەسێکی شارەزادا دەگەڕێم و هیوادارم ئەو پیاوە تۆ بیت. ئەگەر بەباشی لەئەستۆی ئەنجامدانی ئەم کارە بەربێیت، پێگەی تۆ بەرز دەکەمەوە. وتی: هیوادارم بتوانم دڵی سەروەری باوەڕداران خۆشحاڵ بکەم. وتی: خۆت حەشاربدە و کەس لەکارەکەی خۆت ئاگادار مەکەرەوە و لەفلاَن ڕۆژە وەرە لای من. ئەو، لەو

کاتەدا ڕۆشتە لای مەنسور. مەنسور پێی وت: ئامۆزاکانی ئێمە دەیانەوێت ڕێگەی فرت و فێڵ بگرنەبەر و ناسازگاری لەگەڵ ئێمەدا بکەن و خەلافەت بگرنە دەست. ئەوان لەخوراسان لەفلان گوند شوێنکەوتەیان هەیە کەنامەیان بۆ دەنووسن و دیارییان بۆ دەنێرن و زەکات سامانەکانی خۆیان، پێشکەش بەوان دەکەن. بەسامانێکی فراوان و جل و بەرگی گرانباییی بەرێکەوە، شارەزایەکی نەناسراو لەگەڵ خۆت ببە و نەناسراو بەنامەیەك کە لەلایەن ئەو خەڵکەوە نووسرا بێت. برۆ لای ئەوان تا بەتەواوی لەباروودۆخ و مەبەست و کارەکانی ئەوان ئاگادار ببیتەوە. ئەگەر لەبۆچوونەکەی خۆیان پەشیمان بووبێتنەوە، باشترە و ئەگەر لەسەر بۆچوون و مەبەستەکەی خۆیان پێداگریان کرد، حەز دەکەم بزانم و ئاگادار بم. بەرێکەوە تا چاوت بەعەبدوالله کوڕی حەسەن بکەوێت. خۆت وەك کەسێکی خۆپارێز و خواپەرەست نیشان بدە. ئە گەر لەبەرابەر تۆ خۆڕاگریان کرد، خۆڕاگربە و بەردەوام سەردانی بکە تا باوەڕت پێدەکەن و نهێنییەکانی خۆیان دەدرکێنن. کاتێك لەمەبەست و کارەکانی ئەوان ئاگادار بوویتەوە، بەپەلە بۆ لای من بگەڕێرەوە.

ئەو، بەرێکەوت و هاورێ لەگەڵ نامەیەك ڕۆشتە لای عەبدوالله کوڕی حەسەن. عەبدوالله ئەوی بەبێگانە بینی و پشتی تێکرد. ئەوی لەخۆی دوورخستەوە و وتی: ئەم کەسانە ناناسم. بەڵام ئەو بەردەوام سەردانی دەکرد تا ئەوەی بەدیاری و زێر و زیوەکان رازی و باوەڕی پێکرد. عوقبە وتی: وەڵامی شوێنکەوتەکانت بنووسە. وتی: بەهیچ شێوەیەك نامە نانووسم بەڵام تۆ پەیك و پەیامی من بە و پێیان بڵێ لەفلان و فیسارە ڕۆژ، بزوتنەوەکەی خۆم دەستپێدەکەم.

عوقبە بۆلای مەنسور گەڕایەوە و ئاگاداری کردەوە. مەنسور مەبەستی حەج کردنی کرد و بەعوقبەی وت: کاتێك منالەکانی حەسەن هاورێ لەگەڵ عەبدوالله کوڕی حەسەن بێنە لای من، ڕێزیان دەگرم و لەتەنیشت خۆم، دایان دەنیشێنم و نانیان لەگەڵ دەخۆم. کاتێك لەخواردن تەواو بووین، بەچاوی ئیشارە لەتۆ دەکەم. لەم کاتەدا تۆ هەستە و لەبەرابەر ئەودا بێستە. ئەو چاو لەسەر تۆ هەڵدەگرێت. بەدەوری ئەودا بسوڕێرەوە و بڕۆرە پشت سەری و پەنجە گەورەی قاچت لەپشتی بدە تا لەبینینی تۆ سەریسوربمێنێت. دواتر بەدوای کاری خۆتا برۆ. ئاگادار بە تا ئەو کاتەی نانی نەخواردوە، خۆتی نیشان نەدەیت.

مەنسور بەمەبەستی حەج کردن بەرێکەوت. کاتێك چاوی بەمنالەکانی حەسەن کەوت، عەبدوالڵەی لای خۆی دانیشاند و نانیان داوا کرد و هەموویان خواردیان. دواتر سفرەکەیان

هەڵگرت. مەنسور رووی کردە عەبدوالله کوڕی حەسەن و وتی: دەزانی چەندە سوێند و پەیمانت بەئێمەداوە کەرێگەی ناسازگاری لەگەڵ من نەگریتەبەر بۆ لەناو بردنی خەلافەتەکەم هەوڵ نەدەیت. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، رێزی پەیمان و سوێندەکانی خۆم دەگرم. مەنسور بەچاو ئیشارەی لەعوقبە کرد کەخۆی نیشانی عەبدوالله دا. عەبدوالله سەیری نەکرد. عوقبە سوڕا و ڕۆشتە پشت سەری و بەپەنجە گەورەی قاچی لێیدا. عەبدوالله سەری بەرز کردەوە و سەیری کرد و دواتر هەستا و لەبەرابەر مەنسور و وەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بمبەخشە، خوا بتبەخشێت. مەنسور وتی: خوا نەمبەخشێت ئەگەر تۆ ببەخشم. دواتر فەرمانی زیندانی کردنی ئەوی دەرکرد.

محەممەد پێشتر رووی کردبووە بەسرە و لەناو منداڵەکانی راسب دابەزیبوو و پێشنیاری رێبەری خۆی بەخەڵکان دەکرد. دەستەیەك دەڵێن: لای عەبدوالله کوڕی شەیبان (یەکێك لەخەڵکانی بەنی مورە کوڕی عوبەید) دابەزی. دواتر لەوێ ڕۆشت. مەنسور ئاگادار بوویەوە کەئەو رووی کردۆتە بەسرە. بەپەلە بەرەو بەسرە ئەسپی غاردا لای حوری گەورە، دابەزی. عەمرۆ کوڕی عوبەیدی بینی و پرسیاری لێکرد: ئایا لەبەسرە کەسێك دبینی بۆ خەلافەتی خۆمان لێی بترسین؟ وتی: نە. وتی: پشت بەقسەکەت ببەستە و بەرێکەوە. وتی: ئەو کارە دەکەم.

محەممەد پێش هاتنی مەنسور، بەسرەی بەجێهێشت. مەنسور گەڕایەوە و ترسی محەممەد و ئیبراهیم، ئەوی نیگەران دەکرد. ئەم دووانە بەرێکەوتن، سەرەتا ڕۆشتنە عەدەن و دواتر بۆ سند و دوای ئەو بۆ کوفە و لەکۆتاییدا گەڕانەوە بۆ مەدینە.

مەنسور لەساڵی ١٤٠/ ٧٥٧ زایینی، حەجی کرد و سامانێکی فراوانی لەنێوان بنەماڵەی ئەبوو تالیب بەخشییەوە. محەممەد و ئیبراهیم خۆیان نیشاننەدا. سەبارەت بەو دووانە پرسیاری لەباوکیان کرد. وتی: هەواڵیان نازانم. ئەم دووانە بەشێوەیەکی توند و ناخۆش لەگەڵ یەك دوان و مەنسور وشەی (مژینی) هێنایە سەرزمان و وتی: فلان و فیسارە شوێنی دایکت بمژە! وتی: ئەی باوکی جەعفەر: مەبەستت کام یەك لەدایکەکانمە؟ فاتیمە کچی پێغەمبەر(د.خ) یا فاتیمەی کچی حسەین یا دایکی ئیسحاق کچی تەڵحە یا خەدیجە کچی خوەیلد (هاوسەری پێغەمبەر(د.خ))؟ وتی: هیچیان بەڵکو حەربا ء کچی قەسامە کوڕی زوهەیر (ژنێك لەتەی). موسەییب کوڕی زوهەیر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، رێگەم بدە ئەم رووسپی زادە بکوژم. زیاد کوڕی عەبدوالله هەستا و عاباکەی خۆیدا بەسەر ئەودا و وتی:

ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو بەمن ببەخشە تا دوو کوڕەکەی بێنمە لای تۆ. بەمشێوەیە ئەوی رزگار کرد.

محەممەد و ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله، خۆیان شاردبوویەوە تا ئەو کاتەی مەنسور لەساڵی ١٤٠/ ٧٥٧ زایینی، حەجی کرد. ئەم دووانە لەکاتی هاتنی مەنسور بۆ مەدینە، ئەو شارەیان بەجێهێشت. دووبارە مەنسور حەجی کرد ئەم دووانە لەمەککە کۆبوونەوە و هەوڵیاندا لەناکاو مەنسور لەناو ببەن. ئەشتەر کوڕی عەبدوالله کوڕی محەممەد بەوانی وت: من لەبەرژەوەندی ئێوە، کۆتایی بەخەلافەتی ئەو دێنم. محەممەد وتی: سوێند بەخوا ئەو ناکوژم تا ئەو کاتەی پێشنیاری راستی و دروستی پێدەکەم. ئەوەی بەڵێنیان لەسەردا بوو، بەفیڕۆ چوو. یەکێك لەفەرماندەکانی مەنسور بەناوی خالید کوڕی حەسان بەنازناوی باوکی عەساکەر، لەگەڵ هەزار پیاوی شەڕکەر بۆ لای ئەوان ڕۆشت. ئەم هەواڵە بەمەنسور گەیشت. بەدوایدا گەڕا بەڵام نەیتوانی بیدۆزێتەوە. بەدوای هاوەڵانیدا گەڕا و ئەوانی کوشت. ئەو فەرماندەیە پەیوەستی محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی محەممەد بوو.

دواتر مەنسور گوشاری خستە سەر زیاد کوڕی عەبدوالله تا محەممەد و ئیبراهیم بدۆزێتەوە. زیاد بەڵێنی ئەم کارەی پێدا. جارێکیان محەممەد هاتە مەدینە و زیاد ئاگادار بوویەوە. ڕێزی گرت و ئەمانی پێبەخشی لەسەر ئەو بنەمای خۆی لەناو خەڵکان ئاشکرا بکات. محەممەد بەڵێنی پێدا. زیاد لەکاتی شەو سوار ئەسپەکەی بوو و لەبازار شوێنێکیان بۆ بینینی یەکتر دیاریکرد. محەممەدیش سوار بوو و بەرێکەوت. خەڵك هاواریان کرد: ئەی مەهدی، ئەی مەهدی! محەممەد و زیاد وەستان، زیاد وتی: ئەمە محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەنە. دواتر وتی: بۆ هەر سەرزەمینێك کەدەخوازیت، برۆ. محەممەد ئاوارە بوو.

مەنسور ئەم هەواڵەی بیست و لەجەمادی الثانی ساڵی ١٤١/ ئۆکتۆبەری ٧٥٨ زایینی، باوکی ئەزهەری بۆ مەدینە نارد. فەرمانی پێدا عەبدعەزیز کوڕی موتەلیب بکاتە فەرمانداری مەدینە و زیاد و هاوەڵانی، دەستگیر و ڕەوانەی کوفە بکات. باوکی ئەزهەر هاتە مەدینە و فەرمانەکانی مەنسوری ئەنجامدا. زیاد و هاوەڵانی بۆ لای مەنسور بەرێکەوتن. زیاد هەشتا هەزار دیناری لەگەنجینەی مەدینە بەجێهێشت. مەنسور ئەوانی زیندانی کرد بەڵام دواتر ئەوانی بەخشی و ئازادی کردن.

مەنسور، محەممەد کوڕی خالید کوڕی عەبدوالڵەی قەسری کردە فەرمانداری مەدینە و فەرمانی پێدا بەدوای محەممەد کوڕی عەبدوالله بگەڕێت. بۆ گرتنی محەممەد کوڕی

عەبدوالله، دەستی ئاوەلاّ کرد. ئەو، لەمانگی رەجەبی ١٤١/ نۆڤەمبەری ٧٥٨ زایینی گەیشتە مەدینە. هەشتا هەزار دینارەکەی هەلگرت و وای نیشاندا بۆگرتنی محەممەد، تەرخانی کردووە. ئەم وتەیە لای باوکی جەعفەر ناخۆش و ئەوی بەدز لەقەڵەمدا. نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا سەراسەری مەدینە بگەرێت. محەممەد کوری خالید ماڵ بەماڵ بەدوای محەممەد کوری عەبدوالله گەرا بەلاّم نەیتوانی هیچ نیشانەیەك لەو بەدەست بێنێت.

کاتێك مەنسور بینی سامانێکی زۆری بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە و نەیتوانیوە محەممەد بدۆزێتەوە، لەگەڵ باوکی عەلا راوێژی کرد. ئەو پیاوێك لەخەڵکی قەیس کوری عەیلان بوو. راوێژی لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی بزانێت سەبارەت بەکاری ئەم دووبرایە، دەبێت چی بکات. باوکی عەلا وتی: بەباشی دەزانم پیاوێك لەبنەماڵەی تەڵحە یا زوبەیر بکەیتە فەرمانداری مەدینە چوونکە ئەوان لەبەر دوژمنایەتی دێرینەیان لەگەڵ ئەم بنەماڵەیە بەدوای ئەواندا دەگەرێن و تەسلیم بەتۆی دەکەن. مەنسور وتی: خوا بتکوژێت، ئەندێشەکەت ناپەسەندە. سوێند بەخوا بیرم لەم کارە کردبوویەوە بەلاّم پەیمانم لەگەڵ خواوەند بەستوە کە بەدەستی دوژمنەکانم تۆڵە لەئامۆزا و کەسەکانی خۆم نەستێنم. لەجیاتی ئەم کارە، سواڵەکەرێکی بێ سەروپێ لەعەرەبەکان رەوانە دەکەم تا مەبەستەکەم ئەنجام بدات.

مەنسور لەگەڵ یەزید کوری یەزیدی سولەمی راوێژی کرد و پێی وت: گەنجێکی هەژارم پێ بناسێنە تا بێ نیازی بکەم و پێگەی سەروەری یەمانییەکان (کوری قەسری) پێببەخشم. وتی: ئەو کەسە ریاح کوری عوسمان کوری حەییانی موررییە. مەنسور لەمانگی رەمەزانی ساڵی ١٤٤/ دێسامبەری ٧٦١ زایینی، ئەوی وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان کرد.

دەڵێن: ریاح بەڵێنی بەمەنسوردا ئەگەر وەك فەرمانداری مەدینە هەڵیبژێرێت، محەممەد و ئیبراهیم کورەکانی عەبدوالڵەی تەسلیم دەکات. مەنسور ئەوی کردە فەرمانداری مەدینە. ریاح بەرێکەوت تا گەیشتە مەدینە. کاتێك رۆشتە ناو ماڵەکەی مەروان، کۆشکی فەرمانداری، بەدەرگاوانێك بەناوی باوکی بەختەری وت: ئەمە ماڵی مەروانە؟ وتی: بەڵێ. ریاح وتی: ماڵێکە خەڵکان فراوان و خێراخێرا، لێی دادەبەزن و بەخێرایی و بەپەلە، لێی دەرۆنەدەر. ئێمە یەکەم کەسانین لەم ماڵە دەرۆینەدەر. کاتێك خەڵکان لەدەوری ئەو بلاّوەیان لێکرد، بەدەرگاوانەکەی وت: ئەی باوکی بەختەری، رێنوێنیم بکە تا برۆمە لای ئەم پیرە (عەبدوالله کوری حەسەن). ئەم دووانە رۆشتنە لای. ریاح وتی: ئەی پیرەپیاو، سوێند بەخواوەند سەروەری باوەرپدران لەسەر بنەمای خزمایەتی یاچاکەکاری، فەرمانداری بەمن

نەسپاردووە. سوێند بەخوا ناتوانێت بەو شێوەی گاڵتەت و گەمەت بە زیاد و کوڕی قەسری کرد، گاڵتە و گەمە بەمن بکەیت! عەبدوالله کوڕی حەسەن سەری بەرز کردەوە و وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا تۆ ئەو پیاوە چاوشینە هیچ و پووچەی قەیسیت کەهاوشێوەی مەڕ، سەرت دەبڕن.

باوکی بەختەری دەڵێت: سوێند بەخوا ریاح دەستی گرتم و هەستم بەساردی دەستی ئەو کرد و بینیم قاچەکانی بەسەر زەویدا رادەکێشێت لەبەر ئەوەی لەترسی وتەکەی عەبدوالله، بێزار ببوو. دەڵێت: وتم: ئەم پیاوە شارەزای غەیب نییە، ئارام بە. وتی: بەڵێ، قوڕ بەسەرت، سوێند بەخوا ئەوەی کەبیستوویەتی، هێنایە سەرزمان. زۆری نەخایاند ئەویان وەك مەڕ، سەر بڕی.

دواتر ئەو، قەسری بانگ کرد و سەبارەت بەسامان و داراییەکان، پرسیاری لێکرد. ئەشکەنجە و دواتر خستیە زیندان و رەزامی دەبیری ئەوی گرت. لەئەشکەنجە کردنی رەزام، سنوری بەزاند و داوای لێکرد ئاگاداری بکاتەوە کە محەممەد کوڕی خالید، چەندە سامانی (بەبیانوی شوێنکەوتنی محەممەد و ئیبراهیم) تالان کردووە. رەزام، وەڵامی نەدەدایەوە. کاتێك ئەشکەنجە کردنی ئەو بەردەوام بوو، لەهەموو نهێنییەکان ئاگاداری کردەوە. دووبارە وتی: ئەم هەواڵە لەکاتی کۆبوونەوەی خەڵکان باس بکە. ئەو کارەی کرد. کاتێك خەڵکان کۆبوونەوە، ئەوی بانگ کرد. وتی: ئەی خەڵکینە، سەروەرمان فەرمانی پێداوم هەزینەکانی کوڕی خالید باس بکەم و ئێوەی لێ ئاگادار بکەمەوە. من هەواڵێکی درۆیینەم هەڵبەست تا سەروەری خۆم رزگار بکەم. ئێستا ئێوە بەشایەت دەگرم کەهەمووی وتەکانم ناڕاستە. رەیاح فەرمانیدا سەد قامچی لێبدەن و دووبارە، زیندانی بکەن.

ریاح بەدوای محەممەد دەگەڕا. ئاگاداریان کردەوە محەممەد لەدۆڵێك لەدۆڵەکانی رەزووە کە لەنێوان کوێستانەکانی جۆهەینە جێگیرە و بەشێکە لەشاری یەنبەع. فەرمانی بەکارگوزارەکەی خۆیدا لەو ناوچەیە بەدوای محەممەد بگەڕێت. محەممەد پیادە لەوێ هەڵات و رزگاری بوو. ئەو، منداڵێکی کەم تەمەنی بوو کە لەکاتی دەربەدەری لەکەنیزێك، چاوی بەدنیا هەڵهێنا بوو. منداڵەکە لەکێوەکە کەوتەخوار و لەت لەت بوو. محەممەد هۆنراوەیەکی هۆنییەوە: ((رووی کردە خۆی و سەرکۆنەی خۆی کرد)):

| | |
|---|---|
| منخرق السر بال یشکو الوجی | تنکبە اطراف مرو حداد |
| شردە الخوف فازری بە | کذاك من یکرة حر الجلاد |

قد كان فی الموت له راحة          و الموت حتم فی رقاب العباد

یانی: پیاوێکی پانتۆڵ دڕاوە کە لەترس، بێزار بووە. لێوە تیژەکانی شمشێری بڕەر، بۆ ئەم لاولا راوی دەنێن. ترس ئەوی ئاوارە و دەربەدەر و ریسوا کردووە، بەمشێوەیە ژیانی کەسێك کە لەبەریەك کەوتنی شمشێرە ئاودارەکان، بترسێت. مەرگ دەیتوانی ئاسوودەی بکات، هەرچەندە مەرگ هاوشێوەی گەردنبەندێکە کەخوازراو و نەخوازراو، دەیکەنە ملی خەڵکان.

رۆژێك کەریاح لەبەردەلانێکی گەرم، رێگەی دەبڕی، لەناکاو محەممەدی بینی. محەممەدی رێگەکەی گۆڕی و ڕۆشتە سەر چالاوێك و ئاوی دەرهێنا. ریاح وتی: خوا بیکوژێت، چ عەرەبێکی بیابانگەڕی بەهێزە.

## زیندانی کردنی منالەکانی حەسەن

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەمەنسور ئەوانی زیندانی کرد. دەستەیەك دەڵێن: ریاح ئەوانی زیندانی کرد.

عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی دەڵێت: لەمەقسورە ڕۆشتینە بەردەم ماڵەکەی ریاح. دەرگاوان وتی: هەر کەس لەنێوە لەمنالەکانی حسەینە، بێتە ژوور. ئەوان لەدەرگای مەقسورە (کۆشك، سایەوان، ئەیوان) ڕۆشتنە ژوور و لەدەرگای مەروان، ڕۆشتنەدەر. دواتر وتی: هەرکەس لەمنالەکانی حەسەنە، بێتە ژوور. ئەوان لەدەرگای مەقسورە ڕۆشتنە ژوور و ئاسنگەران لەدەرگای مەروان، هاتنە ژوور. بەند و زنجیریان داوا کرد و ئاسنگەران، ئەوانیان بەستەوە. دواتر ئەوانی زیندانی کرد. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی، حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، جەعفەر کوڕی حەسەن کوڕی حسەین، سلێمان کوڕی داوود کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، عەبدوالله کوڕی داوود کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، عەباس کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی و موسا کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن.

کاتێك ئەوانی زیندانی کرد، بینی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی حەسەنی خواپەرەست،

لەناو ئەواندا نییە. بۆ بەیانی، پیاوێك هاتەژوور كەجل و بەرگی لەخۆیەوە ئاڵاندبوو. ریاح وتی: بەخێر بێیت، چ نیازێکت هەیە؟ وتی: هاتووم تا لەگەڵ ئەوان زیندانیم بكەیت. ئەو، عەلی كوڕی حەسەن كوڕی حەسەن بوو. ئەویشی زیندانی كرد. عەلی كوڕی حەسەن لەزیندان مایەوە تا ئەو كاتەی مرد.

محەممەد، عەلی كوڕی بۆ میسر ناردبوو تا پێشنیاری فەرمانبەری كردنی لەخۆی بەخەڵکان بكات. فەرمانداری میسریان لەكارەكانی ئەو ئاگادار كردەوە و وتیان: ئەو، دەیەوێت ئاڵای شۆڕش دژی تۆ بەرز بكاتەوە و مەبەستی ئەوەی كردووە لەگەڵ هاوەڵانی هێرش بكاتە سەرتۆ. ئەوی گرت و رەوانەی كوفەی كرد. عەلی دانی بەهەموو شتێكدا نا و ناوی هاوەڵانی باوكی برد. لەناو ئەو كەسانەی ناوی بردن، عەبدولرەحمان كوڕی ئەبی موالی و باوكی حوبەیر، دەبینران. مەنسور ئەو دووانەی ئەشكەنجە و زیندانی كرد و عەلیشی لەگەڵ ئەوان، خستە زیندان.

مەنسور نامەی بۆ ریاح نووسی كەهاورێ لەگەڵ ئەوان محەممەد كوڕی عەبدواللە كوڕی عەمرۆ كوڕی عوسمان كوڕی عەففان ناسراو بەناوی دیبا، زیندانی بكات. ئەو لەدایكەوە برای عەبدواللە كوڕی حەسەن كوڕی حەسەن بوو چوونكە هەموویان منداڵی فاتیمە كچی حسەین كوڕی عەلی بوون. ریاح، ئەویشی خستە زیندانەوە.

دەستەیەك دەڵێن: مەنسور، عەبدواللە كوڕی حسەن كوڕی حەسەن كوڕی عەلی بەتەنیا، زیندانی كرد و كەسانیتر لەمنداڵەكانی حەسەنی پشتگوێ خست. ئەو بەردەوام لەزینداندا گرفتار بوو. حەسەن كوڕی حەسەن كوڕی حەسەن، لەزیندان مایەوە تا ئەو كاتەی رەنگی قژی گۆڕا. لەخەمی براكەی بەم شێوەیە پیر و تێكشكا. مەنسور بەردەوام دەیوت: ژن داغ دیتوو چی بەسەرهات كەدەستی لەئارایشت كردنی خۆی هەڵگرت؟ رۆژێك حەسەن كوڕی حەسەن كوڕی حەسەن لای ئیبراهیم كوڕی حەسەن تێپەڕی كەوشترەكانی خۆی دەلەوەڕاند. پێی وت: وشترەكانی خۆت دەلەوەڕێنێت لەكاتێكدا عەبدواللە لەزینداندایە. ئەی كوڕە، ئەژنۆبەندی وشترەكان بكەرەوە. ئەوانی كردەو دواتر هێی لێكردن. چیتر هیچ نیشانێكیان لەوشترەكان نەبینییەوە.

## بردنی ئەوان بۆ عێراق

کاتێك مەنسور لەساڵی ١٤٤/ ٧٦١ زایینی حەجی کرد، محەممەد کوڕی عیمران کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە و ئەنس کوڕی مالکی بۆ لای منداڵەکانی حەسەن نارد. ئەوان لەزینداندا بوون. داوای لێکردن تا محەممەد کوڕی عەبدوالله و ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله‌ی تەسلیم بکەن. ئەم دووانە ڕۆشتنە لای منداڵەکانی حەسەن. عەبدوالله بۆ نوێژ وەستا بوو. پەیامەکەیان گەیاند. حەسەن کوڕی حەسەن برای عەبدوالله وتی: ئەم کارە لەزیانی ئەم دوو هەتیوە (دو زادەی ژنی شووم)ە! سوێند بەخوا ئەم کارە بەدڵخوازی ئێمە نەبوو و راوێژیان لەگەڵ ئێمە نەکردووە. ئیبراهیمی برای پێی وت: بۆ بەجوێندان بەکوڕەکانی، براکەت دەڕەنجێنیت و بەبردنی ناوی دایکی، دڵی برازاکەت، دەنێشێنیت؟ عەبدوالله لەنوێژ تەواو بوو. نێردراوەکانی مەنسور، پەیامەکەیان گەیاند. وتی: سوێند بەخوا یەك وشە بەئێوە ناڵێم، ئەگەر دەخوازێت، دەتوانێت مۆڵەتم پێبدات تا بڕۆمە سەردانی. دوو نێردراو، مەنسوریان لەپەیامەکەی ئەو ئاگادار کردەوە. وتی: دەیەوێت، ئەفسوونم بکات. نەبەخوا، هیچ کات چاوی بەچاوی من ناکەوێت تا ئەو کاتەی کوڕەکانی تەسلیم دەکات.

عەبدوالله بەرادەیەك زمان پاراو و خۆش قسە بوو کە لەگەڵ هەر کەس گفتوگۆی دەکرد، ئەندێشە و بۆچوونی دەگۆڕی.

مەنسور، درێژەی بەرێگەی خۆیدا. کاتێك حەجی کرد و گەڕایەوە، نەڕۆشتە ناو مەدینە و بەرەو رەبزە، بەرێکەوت.. ریاح بۆ بینینی مەنسور بەرەو رەبزە ئەسپی غاردا. مەنسور فەرمانی پێدا منداڵەکانی حەسەن لەگەڵ محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمان بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. ریاح گەڕایەوە، ئەوانی ڕەوانەی رەبزە کردو دەست و پێی ئەوانی بەزنجیر بەستەوە و سوار وشتری بۆ کۆپانی کردن. کاتێك ریاح لەگەڵ ئەوان لەمەدینە ڕۆشتەدەر، جەعفەر کوڕی محەممەد (ئیمامی شەشەمی شیعەکان) لەپشت پەردەوە ئەوانی دەبینی، بەڵام ئەوان، ئەویان نەدەبینی، سەیری ئەوانی دەکرد و فرمێسکی لەچاو دەباراند تا ئەو جێگەی ڕیشی بەتەواوی تەڕ بوو. بەردەوام لەخوا دەپاڕایەوە و دەیوت: سوێند بەخوا دوای ئەوان، دوو بارەگای خوایی، پارێزراو نابێت.

کاتێك بەرێکەوتن، محەممەد کوڕی عەبدوالله و ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله، جل وبەرگی

بیابانگەڕەکانیان پۆشی و هاوڕێیەتی باوکیان کرد و لەگەڵی دوان. داوای مۆڵەتیان کرد تا بزوتنەوەکەی خۆیان دەستپێبکەن. دەیوت: پەلە مەکەن تا توانایی پێویست بەدەست بێنن و دەرفەتی گونجاوتان دەستکەوێت. بەم دووانەی وت: ئەگەر مەنسور ڕێگە نادات ئازادانە بژین، ناتوانێت ڕێگەتان لێبگرێت کەپیاوانە بمرن.

کاتێك گەیشتنە رەبزە، محەممەد کوڕی عەبدوللە عوسمانی ڕۆشتە لای مەنسور، پانتۆڵێکی نەرم و شەرواڵێکی ناسکی لەبەرا بوو. کاتێك لەبەردەمی وەستا، مەنسور پێی وت: ها، ئەی زادەی ژنی گایێراو! محەممەد وتی: پەنا بەخوا، لەمناڵیەوە تا گەورەیی بەشێوەیەکی دیکە دەمناسیت.؟ وتی: کچەکەت روقیە، لەکێ دووگیان بووە؟ ئەو ژنی ئیبراهیم کوڕی عەبدوللە کوڕی حەسەن بوو. مەنسور زیادی کرد: سوێند و پەیمانت بەمندا کەس دژی من هاننەدەیت، ئێستاکە دەبینی کچەکەت دووگیانە و هاوسەرەکەی بەجێیهێشتوە. یا تۆ پەیمانی شکێنیت یا ژن گایێراو! سوێند بەخوا بەردبارانی دەکەم. محەممەد وتی: پەیمانەکەی من، وەك خۆی ماوەتەوە، سوێندی خوایی لەئەستۆمدا بێت ئەگەر دژی تۆ کارێکم کردبێت، ئەوەی بۆ ئەم کچەت هەڵبەست، خواوەند ڕێزی لێگرتووە کەلە لەنەژادی پێغەمبەر(د.خ)، دووگیانی کردووە. گومانم ئەوەیە هاوسەرەکەی لەکاتێکی نەزانراو و بەشێوەیەکی نهێنی، لەگەڵ ئەودا خەوتبێت. مەنسور لەوتەکانی ئەو توڕە و فەرمانیدا جل و بەرگەکانی بدرێنن بەشێوەیەك شەرمی دەرکەوت. دواتر فەرمانیدا سەد و پەنجا قامچی لێبدەن. ئەو لەژێر، زەربەکانی قامچی نەت و پەت و بریندار بوو. مەنسور بەردەوام لەسەر وتەکانی بەردەوام و پێداگری دەکرد. قامچییەك بەر روخساری کەوت، وتی: هاوار لەتۆ، واز لەروخسارم بێنە چوونکە لەلایەن پێغەمبەرەوە ڕێزی لێگیراوە. مەنسور توڕە و بەجەلادی وت: قامچی لەسەری بدە، قامچی لەسەری بدە. نزیکەی سی قامچییان لەسەریدا و یەکیان بەرچاوی کەوت و کوێری کرد. بردیانەدەر لەکاتێکدا جەستەی شین و مۆر ببوو. ئەو، یەکێك بوو لەجوان روخسارەکان. لەبەر جوانی روخسار، بەدیبا، ناویان دەبرد.

کاتێك ڕۆشتەدەر، یەکێك لەکۆیلەکان هەستا و وتی: بەعاباکەم داتپۆشم؟ وتی: بەڵێ، خوا بتبەخشێت! سوێند بەخوا دڕانی جلەکانم بەئازارتر لەقامچییەکان بوو.

هۆکاری گرتنەکەی ئەوە بوو کەریاح بەمەنسوری وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵکانی خوراسان، شیعەکانی ئێوەن بەڵام خەڵکانی عێراق، شیعەکانی بنەماڵەی ئەبوو تالیبن وخەڵکانی شام، عەلی لای ئەوان پیاوێکی ناباوەڕە بەڵام ئەگەر محەممەد کوڕی

عەبدوالله کوڕی عوسمان، داوای هاوکاریان لێبکات، هەمووان هاوکاری دەکەن. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر مەنسور دانا. فەرمانی گرتنی ئەوی دەرکرد. پێشتر گومانی لەو نەدەکرد.

باوکی عەون نامەی بۆ مەنسور نووسی: خوراسانییەکان لەدەوری من بلاّوەیان لێکردووە و کاری محەممەد کوڕی عەبدوالله لەگەڵ ئەوان بەردەوامە. مەنسور فەرمانیدا کەمحەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عومەری عوسمانیان سەربڕی و سەری ئەویان بۆ خوراسان برد و سوێندیان خوارد کەسەری محەممەد کوڕی عەبدوللایە و دایکی فاتیمە کچی پێغەمبەری خوایە. کاتێك کوژرا، براکەی، عەبدوالله کوڕی حەسەن وتی: هەموان لەلایەن خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە (بقره، ٢/ ١٥٦). سوێند بەخوا لەکاتی فەرمانڕەوایی ئەوان ئاسوودە نەبووین و ئێستا لەکاتی فەرمانڕەوایەتی خۆمان کوشتار دەکرێین.

مەنسور ئەوانی هەڵگرت و لەگەڵ خۆی، لەرەبزەوە ڕەوانەی کردن. سوار لەسەر ئێسترێکی خۆڵەمێشی لای ئەوان تێپەڕی. عەبدوالله کوڕی حەسەن، بانگی کرد: ئەی باوکی جەعفەر، ئێمە لەشەڕی بەدر بەمشێوەیە لەگەڵ دیلەکانی ئێوە هەڵس وکەوتمان نەکرد (باوەگەورێی عەباسییەکان، عەباس کوڕی عەبد موتەلیب، لەکاتی شەڕی بەدر، بتپەرست بوو) باوکی جەعفەر پێی وت: دەمت داخە. وتەکەی ئەوی پێ ناخۆش بوو بەلاّم درێژەی بەرێگەکەی خۆیدا. کاتێك گەیشتنە کوفە، عەبدوالله بەهاورێکانی وت: ئایا لەم شارەدا کەسێك نییە ئێمە لەدەست ئەم ستەمکارانە رزگار بکات؟ دەڵێت: حەسەن و عەلی کوڕەکانی براکەی چاویان پێی کەوت لەکاتێکدا شمشێریان لەکەمەر بەستبوو، وتیان: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا، هاتووینە خزمەت تۆ، فەرمانبەرین، فەرمان بدە. وتی: ئەوەی لەئەستۆتاندا بوو، ئەنجامتاندا بەلاّم ئەم کارە لەبەرژەوەندی ئێمەدا نییە. ئێوە دووانە بەتەنیا ناتوانن هیچ کارێك بکەن. ئەوان، گەڕانەوە.

مەنسور ئەوانی بردە کۆشکی کوڕی هوبەیرە لەرۆژهەلاّتی کوفە. مەنسور، محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەنی بانگ کرد کەیەکێك بوو لەجوان روخسارەکانی جیهان، پێی وت: تۆ دیبای گەورەییت؟ وتی: بەڵێ. وتی: بەشێوەیەك دەتکوژم کەتا ئەمڕۆ، کەس بەو شێوەیە نەکوژرابێت. فەرمانیدا بەزیندوویی لەسەر زەوی رایانکێشا و ستوونێکیان لەسەر جەستەی دروست کرد کە لەئازارەکەی گیانی سپارد.

ئیبراهیم کوڕی حەسەن پێش هەموان گیانی ئەسپەردە کرد و دوای ئەو عەبدوالله کوڕی حەسەن کوژرا و لەتەنیشت شوێنی کوژرانەکەی، بەخاك سپێردرا. ئەگەر ئەو ئارامگای

خەڵکان بەهی ئەوی دەزانن، ئەوە بێت، گێڕانەوەکە راستە وگەرنە، لەتەنیشت شوێنی گۆڕانەکەی بەخاك سپێردراوە. دوای ئەو، عەلی کوڕی حەسەن گۆڕرا. دەستەیەك دەڵێن: مەنسور فەرمانی کوشتاری ئەوانی دەرکرد. دەستەیەك دەڵێن: بەمشێوە نەبوو بەڵکو فەرمانیدا ئەوان ژەهر خوارد بکەن. دەستەیەك دەڵێن: مەنسور کەسێکی بۆ عەبدوالله دانا کەپێی وت: محەممەدی کوڕت بزوتنەوەکەی دەستپێکردووە و کوژراوە. بەمشێوە لەئازاری کوژرانی کوڕەکەی، ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

لەناو ئەوان تەنیا ئەم کەسانە رزگاریان بوو: سلێمان کوڕی داوود کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی، عەبدوالله کوڕی داوود کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن، ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن و جەعفەر کوڕی حەسەن. بەمشێوەی تۆماری ژیانی ئەوان کۆتایی هات.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا فەرمانداری مەککە، سەری کوڕی عەبدوالله، فەرمانداری مەدینە، ریاح کوڕی عوسمان، فەرمانداری کوفە، عیسا کوڕی موسا، فەرمانداری بەسرە، سوفیان کوڕی معاویە، فەرمانداری میسر، یەزید کوڕی حاتەم کوڕی قوتەیبە کوڕی موهەلیب کوڕی ئەبی سەفرە بوو. یەزید کوڕی سابت بۆ وەسف کردنی ئەو و سەرکۆنەی کردنی یەزیدی ئەسلەمی دەڵێت:

لشتان ما بين اليزيدين فی الندی      يزيد سليم و الاغر بن حاتم

یانی: چەندە دوورە رێگەی نێوان دوو یەزید، یەزیدی سەلیم و ئەو پیاوە ناوچاو سپیە روو گەشە.

ئەم هۆنراوەیە چەندین بەیتی هەیە. یەزید کوڕی حاتەمیان وەسف دەکرد چوونکە پیاوێکی بەخشەر بوو.

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عوزرەی فێهری (بەمناڵەکانی عەمرۆ) و یوسف کوڕی عەبدولرەحمانی فێهری لەتۆڵەدۆ لەبەرابەر ئەمیر عەبدولرەحمانی ئومەوی، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە. دانیشتوانی شارەکە پشتیوانیان لێکردن. عەبدولرەحمان رووبەرووی بوویەوە و گەمارۆی خستە سەر و گرفتاری کرد. ئەو، خوازیاری ئاشتی بوو و کوڕەکەی ئەفلەحی وەك بارمتە تەسلیم بە عەبدولرەحمان کرد. عەبدولرەحمان بارمتەکەی وەرگرت و بۆ

کوردوا گەڕایەوە. هوشام دووبارە ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و عەبدولرەحمان، هێرشی کردەسەر و قەلآکوتەکانی بۆ جێگیر کرد. قەلآکوتەکان کاریگەریان نەبوو چوونکە ئەو شارە بەهێز بوو. ئەفلەحی کوڕی هوشامی کوشت و سەری بەمەنجەنیق بۆ ناو شارەکە هاویشت. عەبدولرەحمان بۆ کوردوا گەڕایەوە بێ ئەوەی بتوانێت شکست بەهوشام بێنێت.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەبدوالله کوڕی شێبرەمە، عەمرۆ کوڕی عوبەیدی موعتەزیلی کەپیاوێکی خواپەرست بوو، بەرید کوڕی ئەبی مریەم موالی سەهل کوڕی حەنزەلییە، عەقیل کوڕی خالیدی ئەیلی فەرمانداری زەهری کە لەمیسر بەشێوەیەکی کتوپڕ، مرد، محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی عەلقەمە کوڕی وەقاسی لەیسی بەنازناوی باوکی حەسەنی مودەنی، هاشم کوڕی عوتەبە کوڕی ئەبی وەقاسی مودەنی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و پێنجی کۆچی (( ٧٦٢ زایینی ))
## بزوتنەوەی محەممەد کوڕی عەبدواللە کوڕی حەسەن

لەم ساڵەدا، دووشەمە بۆ کۆتایی مانگی جەمادی ئالیانی/ ٢٢ سێپتامبەری ٧٦٢ زایینی یا چواردەی ڕەمەزان/ ٦ دێسامبەری ٧٦٢ زایینی، محەممەد کوڕی عەبدواللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، بزوتنەوەکەی خۆی دەستپێکرد. پێشتر ئاماژەمان بەڕەنج و گرفتاریی و ڕەوانە کرانی خۆی و هاوەڵانی بۆ عێراقدا کە بەدوای ئەو فەرمانی مەنسور بۆ ئەو شارە نێردران.

کاتێك ئەوانی ڕەوانە و خۆی لەگەڵیان بەرێکەوت، ریاحی وەك فەرمانداری مەدینە بۆ ئەو شارە گەڕاندەوە. ڕیاح وەك پێشوو، لەشوێنپێ هەڵگرتنی محەممەد پێداگری دەکرد و بەشێوەیەك بەدوایدا گەڕا کەمناڵە بچوکەکەی لەسەر بەرزایی کێوەکە لەدەست کەوتە خوار و لەت لەت بوو. ڕۆژێك محەممەد تەنگی پێهەڵچنرا بوو، ڕۆشتە سەر چاڵاوێکی مەدینە تا ئاو بەهاوەڵانی خۆی بدات، تا قورگی لەئاوەکە نوقم بوو بەڵام سەری بەدەرەوە بوو. ئەم هەواڵە بەریاح گەیشت و پێی وترا کەئەو، لەمەزارە. ریاح لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و شوێنی کەوت.. محەممەد خۆی لەسەر ڕێگەی ئەو دوور خستەوە و لەماڵی جۆهەینە خۆی داشارد. کاتێك ریاح نەیتوانی بیدۆزێتەوە، بۆ ماڵی مەروان گەڕایەوە.

ئەو کەسەی ریاحی ئاگادار کردەوە، سلێمان کوڕی عەبدواللە کوڕی ئەبی سەبرە بوو.

کاتێك عەباسییەکان لەشوێنکەوتنی محەممەد بەردەوام بوون، پێش ئەو کاتەی لەگەڵ براکەی خۆی، عەلی، دیاریکردبوو، بزوتنەوەکەی دەستپێکرد. براکەی لەبەر ئەوە ئەم کارەی دواەخست چوونکە گرفتاری نەخۆشی ئاوڵە ببوو. عوبەیداللە کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەبی زەئب و عەبدولحەمید کوڕی جەعفەر بەردەوام بەمحەممەد کوڕی عەبدوواللەیان دەوت: بۆ لەدەست پێکردنی بزوتنەوەکەت، دوادەکەویت؟ سوێند بەخوا، کەس لەتۆ بۆ ئەم نومەتە شوومتر نییە، بزوتنەوەکەت دەستپێبکە ئەگەرچی تاك و تەنیا بیت. وتەی ئەوان یەکێك بوو لەو هۆکارانەی بۆ دەستپێکردنی بزوتنەوەکەی هانیاندا.

ریاح لەوە ئاگادار بوویەوە محەممەد ئەمشەو بزوتنەوەکەی دەستپێدەکات. محەممەد کوڕی عیمران کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەممەد (دادیاری مەدینە)، عەباس کوڕی عەبدواللە

کوڕی حارس کوڕی عەباس و کەسانی دیکەی بانگ کرد. بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، دواتر پێی وتن: ئەی خەڵکانی مەدینە، سەروەری باوەڕداران لەرۆژهەڵات و رۆژئاوا بەدوای محەممەد دەگەڕێت بەڵام ئەو لەناو ئێوەدا دەدۆزێتەوە. سوێند بەخوا ئەگەر بزوتنەوەکەی دەستپێبکات، هەمووتان کوشتار دەکەم. بەمحەممەد کوڕی عیمرانی وت: تۆدادیاری هەڵبژێردراوی سەروەری باوەڕدارانی، کەس بەدوای کەس و کار و بنەماڵەکەی خۆت بنێرە و ئەوان کۆبکەرەوە. هەروەها فەرمان بەمناڵەکانی زوهرە بدە خۆیان ئامادە بکەن. ئەو، کەسی ڕەوانە کرد کەدەستەیەکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە و لەبەردەم دەرگای کۆشك، دانیشتن. کەسی نارد تا چەند کەسێك لەعەلەوییەکان و شوێنکەوتەکانی ئەوان بێنێت. لەناو ئەوان: جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین، حسەین کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی، حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی و پیاوانێك لەقورەیش وەك ئیسماعیل کوڕی ئەیووب کوڕی سەلە کوڕی عەبدوالله کوڕی وەلید کوڕی موغەیرە و کوڕەکەی، خالید کوڕی ئیسماعیل.

سەرقاڵی ئەم کارە بوون لەناکاو محەممەد، خۆی ئاشکرا کرد و ئەوان، دەنگی تەکبیری ئەویان بیست. کوڕی موسلیم کوڕی عوقەبەی موڕی وتی: وتەی من سەبارەت بەم کەسانە لەگوێ بگرە و هەموویان بکوژە. حسەین کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی وتی: سوێند بەخوا ناتوانیت ئەو کارە بکەیت چوونکە هەمووومان فەرمانبەر و گوێڕایەڵین.

محەممەد لەگەڵ سەد و پەنجا پیاوی شەڕکەر لەمەزارەوە بەرێکەوت و ئەوانی بردە ناو ماڵەکانی مناڵەکانی سەلامە ئەم کارەی بەشێوەیەکی باش، لێکدایەوە. لەناو ئەوان محەممەد کوڕی خالید کوڕی عەبدوالڵەی قەسری و کوڕی براکەی نەزیر کوڕی یەزید و رەزام، دەبینران. ئەوانی دەرکرد. فەرماندەی پیادەکانی بەخەوات کوڕی جوبەیر سپارد و ڕۆشتە ناو کۆشکی فەرمانداری و بەردەوام دەیوت: کەس مەکوژن مەگەر ئەوەی ئەوان دەست بۆ کوشتنی ئێوە درێژ بکەن.

ریاح لەناو ماڵەکەیدا خۆی حەشاردا و شەڕکەرانی لەدەوری خێوەتەکەی خۆی، جێگیر کرد. ئەوان لەدەروازەی مەقسورەوە ڕۆشتنە ناو و ریاحیان ئەسیر و براکەی عوسمان کوڕی عەففان کوڕی حەییانی موڕی و کوڕی موسلیم کوڕی عوقەبەی موڕییان دەستگیر و لەکۆشکی فەرمانداری، زیندانیان کردن. دواتر محەممەد ڕۆشتە ناو مزگەوت و لەسەر تەختی وتاردان دانیشت. وتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە، سپاسی خوای کرد، وتی: دوای سڵاو، لەم خوێنڕێژە

ستەمکارە، دوژمنی خوا، باوکی جەعفەر، ئەو کارانە دەوەشێتەوە کەهەمووتان لێی ئاگادارن. ئەو کۆشك و گومەزی سەوزی بەرز کردەوە و لەم ڕێگەوە ناسازگاری خواوەند دەکات و کەعبە بەکەم بەها لەقەڵەم دەدات. خواوەند فیرعەونی لەناو برد چوونکە ووتی: من باشترین پەروەردگاری ئێوەم. بەڵام شیاوترینی کەسەکان بۆ گرتنە دەستی کاروباری ئێوە، منالّی موهاجیرەکان و ئەنسارن چوونکە بۆ بەرژەوەندی و سەرکەوتنی ئیسلام، هەوڵیانداوە و چاویان لەخواست و مەبەستەکانی دنیا پۆشیوە و زۆربەیان لەم ڕێگەدا شەهید کراون. ئەی خوایە، ئەوان حەلاڵەکانی تۆیان حەرام و حەرامەکانی تۆیان، حەلاڵ کرد، ئەوانی تۆ هۆشداریت پێدابوون، ئەمانیان بەخشی و ئەمان بەخشراوەکانی تۆیان، ترساند و گرفتار کرد، خواوەندا، یەك یەك، لەناویان ببە و هیچ کام لەوان بەزیندووی مەهێڵەرەوە! ئەی خەڵکینە، من لەبەر ئەوە بزوتنەوەکەم لێرەوە دەستپێنەکرد کەخەڵکانێکی بوێر و شەڕکەر بن، من ئێوەم هەڵبژارد. سوێند بەخوا، کاتێك رووم کردە ئەم سەرزەمینە، خەڵکانی هەموو شارە خواپەرستەکان، بەیعەتیان لەگەڵ بەستبووم.

مەنسور لەوتەی فەرماندەکانی خۆی نامەی بۆ محەممەد دەنووسی و ئەوی بۆ دەستپێکردنی بزوتنەوەکەی هاندەدا. فەرماندەکان بەشێوەیەکی درۆیینە وایان نیشاندەدا کەپەیوەستی دەبن. محەممەد بەردەوام دەیوت: ئەگەر بزوتنەوەکەم دەستپێبکەم، فەرماندەکان هەموویان پەیوەستی من دەبن. محەممەد دەستی بەسەر مەدینەدا گرت و عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی خالید کوڕی زوبەیری وەك فەرمانداری شارەکە، دەستنیشان کرد. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەعەبدعەزیز کوڕی موتەلیب کوڕی عەبدوڵلاەی مەخزومی سپارد، سەرپەرەستی ئەنبار و کەل و پەلی جەنگی بەعەبدعەزیزی دراوەردی و فەرماندەیی پاسەوانەکانی بە باوکی قەلس عوسمان کوڕی عوبەیداللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب و سەرپەرەستی دیوانی بەعەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی عەبدولرەحمان منالّەکانی ئیسرائیل موسەوەر کوڕی مەخریمە و بەوتەی هەندێ کەس، فەرماندەیی پاسەوانەکانی خۆی بەعەبدولحەمید کوڕی جەعفەر سپارد کەدواتر ئەوی لەسەر کارلابرد.

محەممەد بۆ محەممەد کوڕی عەبدعەزیز پەیامی نارد و وتی: گومانم دەکرد هاوکاری ئێمە دەکەیت و لەگەڵ ئێمە ئالای شۆڕش بەرز دەکەیتەوە. ئەو، بیانووی هێنایەوە و وتی: ئەو کارە دەکەم. دواتر بەهێواشی بەرەو مەککە خزا و لەمەدینە ڕۆشتەدەر. کەس لەهاوکاری کردنی محەممەد، پاشەکشێی نەکرد. سەرکردەکانی خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە جگە لەچەند

کەسێك. لەناو ئەوان: زوحاك کوڕی عوسمان کوڕی عەبدوالله کوڕی خالید کوڕی حەزام (خەزام)، عەبدوالله کوڕی مونزەر کوڕی موغەیرە کوڕی عەبدوالله کوڕی خالید، باوکی سەلە کوڕی عوبەیدالله کوڕی عوبەیدالله کوڕی عومەر و حەبیب کوڕی سابت کوڕی عەبدوالله کوڕی زوبەیر.

خەڵکانی مەدینە سەبارەت بەبزوتنەوەکەی محەممەد لەمالك کوڕی ئەنس، پرسیاریان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن پشتیوانی لێبکەن یا ئەوەی دەست لەهاوکاری کردنی ئەو هەڵبگرن. وتیان: ئێمە بەیعەتمان بەباوکی جەعفەرداوە. مالك کوڕی ئەنس وتی: ئێوەیان بەزۆر ناچار کردووە بەیعەتی لەگەڵ بکەن، کەسێك کەبەزۆر بۆ ئەنجامدانی کارێك ناچار بکرێت، هیچ سوێند و پەیمانێکی لەئەستۆدا نییە. خەڵکان بەپەلە، بەیعەیتان لەگەڵ محەممەد کرد و مالك لەماڵەکەی خۆی مایەوە.

محەممەد کەسی بۆ لای ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب (کەپیرێکی بەتەمەن بوو) نارد و داوای کرد بەیعەتی لەگەڵ بکات. ئیسماعیل وتی: تۆ بەناچاری دەبێت بکوژرێیت، چۆن بتوانم بەیعەت لەگەڵ تۆ بکەم ئەی برازای بەرێزم. خەڵك کەم کەم لەدەوری محەممەد، دوور کەوتنەوە.

کوڕەکانی معاویە کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر، هەموویان لەدەوری محەممەد کۆبوونەوە. لەبەر ئەمە حیمادە کچی معاویە کەسی بۆ لای ئیسماعیل کوڕی عەبدوالله نارد و پێی وت: مامی من، براکانم پەیوەستی کوڕە خاڵەکەیان بوون، ئەگەر تۆ لەسەر قسەکانی خۆت سوور بیت، خەڵکان لەدەوریان بلاوە دەکەن و محەممەد و براکانی من دەکوژرێن. ئیسماعیل دەستی لەوتەکانی خۆی هەڵنەگرت و بەردەوام بەرەبەستی لەسەر رێگەی بەیعەت کردنی خەڵکان لەگەڵ محەممەد، دروست دەکرد. حیمادە، رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و ئەوی کوشت. محەممەد ویستی نوێژی لەسەر بخوێنێت. عەبدوالله کوڕی ئیسماعیل رێگەی ئەو کارەی لێگرت و وتی: ئایا خەڵکان ناچار دەکەیت باوکی من بکوژن و دواتر دەتەوێت نوێژی لەسەر بخوێنیت؟ پاسەوانەکانی محەممەد ئەویان دوورخستەوە و محەممەد، نوێژی لەسەر خوێند.

کاتێك محەممەد دەرکەوت، محەممەد کوڕی خالیدی قەسری لەزیندانی ریاحدا بوو کەمحەممەد کوڕی عەبدوالله( رێبەری شۆڕشەکە) ئازادی کرد.

کوڕی خالید دەڵێت: کاتێك گوێم لەبانگەوازەکەی ئەو بوو، وتم: ئەمە بانگەوازی راستی

و دروستییە، سوێند بەخوا، بێ گومان بۆ سەرکەوتنی ئەم بانگەوازە، پیاوانە تێدەکۆشم. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ لەم شارەدا ئاڵای شۆڕشت بەرز کردۆتەوە، سوێند بەخوا ئەگەر کەسێك لەسەر دەروازەکەی دابنیشێت، ڕێگەی چوونەدەرەوە و هاتنە ناوەوەی دەگرێت و خەڵکان لەبرسیەتی و تینوویەتی، گیان دەسپێرن. لەگەڵ من بەرێکەوە چوونکە سوێند بەخوا دەرۆژ ناخایەنێت سەد هەزار شمشێر وەشێن کۆدەکەمەوە. ئەو، رازی نەبوو. جارێك کەلای ئەو دانیشتبووم، پێی وتم: لەناو کالا باشەکان هیچم باشتر لەوە هەڵنەگرت کەلای باوکی خەسیب، دەستمکەوت (سامانەکانی ئەوی تالان کردبوو). دەڵێت: وتم: گومان ناکەم باشترین کالات بەدەستهێنابێت! نامەم بۆ مەنسور نووسی و لەژمارەی کەمی هاوەڵانی محەممەد، ئاگادارم کردەوە. لەبەر ئەمە، محەممەد منی زیندانی کرد تا ئەو کاتەی عیسا کوڕی موسا، چەند ڕۆژ دوای کوژرانی محەممەد، ئازادی کردم.

لەم ناوەدا، لەو کاتەی محەممەد لەمەدینە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە، پیاوێك لەبنەماڵەی ئەویس کوڕی نەبی سەرحی عامری (عامر کوڕی لۆئەی) دەرکەوت کەپێیان دەوت حسەین کوڕی سەخر. ئەو، هەمان کات بۆ لای مەنسور بەرێکەوت و لەماوەی نۆشەو، خۆی پێگەیاند. لەبەر دەروازەی شارەکە وەستا و هاواری کرد. دەرگاوانەکان ئەویان ناسییەوە و بردیانە ژوور. رەبیع وتی: ئێستا و لەم کاتەی شەو، سەرەوەری باوەڕداران، خەوتوە، چ نیازێکت هەیە؟ وتی: دەبێت هەر ئێستا بیبینم. رەبیع ڕۆشتە لای مەنسور و ئاگاداری کردەوە و وتی پیاوێکی بیابانگەڕ دەیەوێت بەتەنیایی، گفتوگۆی لەگەڵ بکات. مەنسور مۆڵەتی دا و عەرەبی بیابانگەڕ، ڕۆشتە لای و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، محەممەد لەمەدینە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە! مەنسور وتی: ئەگەر وتەکانت راست بێت، سوێند بەخوا، ئەوت بەکوشتن داوە. ئاگادارم بکەرەوە چ کەسانێك لەبنەماڵەکەی و گەورەکانی مەدینە، هاورێیەتی دەکەن. ئەو، ناوی کەس و کار و گەورەکانی مەدینەی برد. مەنسور وتی: تۆ بەچاوی خۆت ئەوت بینی؟ عەرەبی بیابانگەڕ وتی: بەچاوی خۆم سەیرم کرد و لەسەر تەختی وتاردانی پێغەمبەر(د.خ)، لەگەڵی پەیڤیم. ئەو، لەسەر تەختی وتاردان دانیشتبوو. باوکی جەعفەر ئەوی بردە ماڵێك و جێگیری کرد. بۆ بەیانی نێردراوی سەعید کوڕی دینار کۆیلەی عیسا کوڕی موسا کەسامانەکانی ئەوی لەمەدینە دەپاراست، گەیشت و لەشۆڕشەکەی محەممەد، ئاگاداری کردەوە. هەواڵەکان یەك لەدوای یەك دەگەیشتن. مەنسور، ئەو پیاوە ئەویسیەی هێنایەدەر و وتی: بێ گومان شەرکەران لەگەڵ تۆ ڕەوانە و دەسەڵاتت

پێدەبەخشم. فەرمانیدا نۆهەزار درەمی پێببەخشن. (بۆ هەر شەوێك، هەزار درەم)

مەنسور، بەتەواوی ترسی محەممەدی لێنیشت. ئەستێرەناسی دەربارەکەی، (حارسی) پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەچی دەترسیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر دەست بەسەر سەراسەری زەویدا بگرێت، زیاتر لەنەوەد رۆژ ناخایەنێت.

مەنسور کەسی بۆ لای عەبدوالله کوڕی عەلی مامی ڕەوانە کرد کە لەزینداندا بوو، پەیامی بۆ نارد: ئەم پیاوە ئالآی شۆڕشی بەرز کردۆتەوە، ئەگەر ئەندێشە یا بۆچوونێکت هەیە، ئێمەی لێ ئاگادار بکەرەوە. وتی: زیندانی، تەنیا ئەندێشەی زیندان، لەسەریدایە. مەنسور پەیامی بۆ نارد: ئەگەر بێتە سەرمن و لەدەرگایماڵەکەم بدات، تۆ لەزیندان ئازاد ناکەم. من بۆتۆ، لەو باشترم، ئەو پاشای بنەماڵەکەی تۆیە. عەبدوالله پەیامیدا: هەر ئێستا بەرێکەوە تا لەکوفە پێ بخەیتە سەر شوێنە هەستیارەکانی ئەوان و گوشاریان بخەیتەسەر، چوونکە خەڵکانی کوفە، شوێنکەوتەی ئەم بنەماڵەن. گەمارۆ بخەرە سەر شارەکە وهەرکەس لەشارەکە بڕواتەدەر یا مەبەستی شوێنێکی دیکە بکات، بیکوژە و کەسێك بەدوای سەلەم کوڕی قوتەیبە بنێرە تا پەیوەستی تۆ ببێت (ئەو لەشاری رەی دەژیت) نامە بۆ خەڵکانی شام بنووسە تا شەڕکەران و بوێرەکانی خۆیان بۆ هاوکاری کردنی تۆ ڕەوانە بکەن، سامانێکی فراوان لەناو ئەواندا دابەش بکە و بەفەرماندەیی سەلەم، ڕەوانەیان بکە. مەنسور، ئەو کارەی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: مەنسور هاورێ لەگەڵ براکانی عەبدوالله، پەیامی بۆ نارد و سەبارەت بەچارەسەر کردنی کێشەی محەممەد، داوای رێگەچارەی لێکرد. پێی وتن: نابێت عەبدوالله بزانێت کەمن، ئێوەم ناردوە. کاتێك ڕۆشتنە لای، پێی وتن: بۆ مەبەستێکی تایبەت هاتوونەتە لای من، ئێوە رۆژگارێکی درێژە سەردانی منتان نەکردووە، چی ڕوویداوە کەهەمووتان لەدەوری من کۆبوونەتەوە؟ وتیان: مۆڵەتمان لەسەروەری باوەڕداران وەرگرت تا سەردانی تۆ بکەین، ئەویش مۆڵەتی پێداین. وتی: ئەم وتەیە بەهایەکی نییە، لەرووداوەکان ئاگادارم بکەنەوە. وتیان: محەممەد کوڕی عەبدوالله، شۆڕشی دەستپێکردووە. وتی: کوڕی سەلامە، (مەنسور) چی دەکات؟ وتیان: سوێند بەخوا نازانین. وتی: رەزیلی و سواڵکەری، ئەوی کوشتووە، پێی بڵێن سامانەکان بێنێتەدەر و لەناو شەڕکەران دابەشی بکات. چوونکە ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنێت لەزووترین کات سامانەکەی بەدەست دێنێتەوە و ئەگەر شکست بخوات، رکەبەرەکەی، دینار و درەمی دەست ناکەوێت.

کاتێك هەواڵی شۆڕشەکەی محەممەد بەمەنسور گەیشت، بەقامیش بناغەی شاری بەغدادی داڕشتبوو. بەرەو کوفە بەرێکەوت و عەبدواللە کوڕی رەبیع کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەدادی لەگەڵ خۆی برد. مەنسور پێی وت: محەممەد لەمەدینە شۆڕشی دەستپێکردووە. عەبدواللە وتی: لەناوچوو و کەسانی دیکەیشی لەناو برد. شۆڕشی دەستپێکرد بێ ئەوەی شەڕکەر و کەرەستەی فراوانی شەڕی لەبەردەستا بێت. سەعید کوڕی عەمرۆ کوڕی جوعدەی مەخزومی کە لەرۆژی شەڕی زاب لەگەڵ مەروان کوڕی محەممەد بوو،(دوایین خەلیفەی ئومەوی)ئاگاداری کردمەوە. مەروان پێی وتم: ئەمە کێیە لەگەڵ من شەڕ دەکات؟ وتم: عەبدواللە کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی عەباس. وتی: خۆزگە لەجیاتی ئەو عەلی کوڕی ئەبی تالب لەگەڵ من شەڕی دەکرد. بەلاّم بەداخەوە، عەلی و منالّەکانی هیچ پشکێکیان لەخەلافەت پێنابرێت. مەگەر ئەو پیاوێك لەهاشمییەکان و کوڕە مامی پێغەمبەر(د.خ) هەلگری شکۆ و مەزنی شام و پشتیوانی خەلّکانی شامە؟ ئەی کوڕی جوعدە، ئایا دەزانێك چ هۆکارێك ناچاری کردم فەرمانڕەوایەك دوای خۆم دەستنیشان و عەبدولەلیك (کوڕەکەیترم) کەگەورەتر لەعوبەیداللەیە، پشتگوێ بخەم؟ کوڕی جوعدە وتی: نە. مەروان وتی: بەروانین لەنهێنییەکانی ئەم جیهانە بینیم کەفەرمانڕەواکانی داهاتوو دوو کەس دەبن بەناوەکانی عەبدواللە و عوبەیداللە (عوبەیداللە بۆ عەبدواللە نزیکتر و خۆشەویستتر بوو تا عەبدولەلیك) من فەرمانڕەوایەتیم بەو سپارد. مەنسور سوێندی دا بۆ ئەوەی لەراست بوونی وتەکەی دلّنیا بێت. کوڕی جوعدە سوێندی خوارد. مەنسور شاد و خەم لەدلّیدا نەما.

کاتێك هەواڵی شۆڕشەکەی محەممەد بەمەنسور گەیشت، بە عەبدولەلیك و باوکی ئەییووبی وت: هیچ پیاوێکی فرەزان دەناسن تا پشت بەبۆچوونەکەی ببەستین؟ وتیان: لەکوفە، بەدیل کوڕی یەحیا، دەناسین (سەفاح لەگەڵ ئەو راوێژی دەکرد). کەسی بۆ لای ئەو نارد و پەیامیدا: محەممەد لەمەدینە ئالاّی شۆڕشی بەرز کردۆتەوە. ئەو، پەیامی بۆ ناردەوە: ئەهواز لیۆانلێو بکە لەپیاوە شەڕکەرەکان. مەنسور وتی: ئەو لەمەدینە ئالاّی شۆڕشی بەرز کردۆتەوە! وتی: دەزانم بەلاّم ئەو شوێنەی دەتوانن زیان بەئێوە بگەیێنن، ئەهوازە. کاتێك ئیبراهیم لەبەسرە دەرکەوت، مەنسور پێی وت کەئەم دوژمنە کۆنە سەری بەرز کردۆتەوە. بەدیل وتی: پیاوە شەڕکەرەکان بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە بکە و خەلّك ئەهواز دژی ئەو راپەڕێنە.

هەروەها مەنسور، لەکاتی دەسپێکردنی بزوتنەوەکەی محەممەد، لەگەڵ جەعفەر کوڕی

حەنزەلەی بەهرانی راوێژی کرد. وتی: سوپاییەکان بۆ بەسرە ڕەوانە بکە. مەنسور وتی: بگەڕێرەوە تا جارێکی دیکە کەسێك بەدوای تۆدا ڕەوانە بکەم. کاتێك ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله بەرەو بەسرە بەڕێکەوت، کەسی بۆ لای جەعفەر کوڕی حەنزەلە ناردەو داوای رێنوێنی لێکرد. جەعفەر دووبارە پێشنیاری یەکەمی باس کردەوە. وتی: من لەشۆڕشی سوپاییەکان دەترسام. وتی: بۆ لەشاری بەسرە، مەترسی زیانت کرد؟ وتی: لەبەر ئەوەی محەممەد لەمەدینە ئاڵای شۆرشی بەرز کردەوە کەخەڵکەکەی پیاوی شەڕ نین، تەنیا دەتوانن سەرقاڵی کاری خۆیان بن، خەڵکانی کوفە لەژێر پێی تۆدان، خەڵکانی شام دوژمنانی بنەماڵەی ئەبووتالبن، کەواتە جگە لەبەسرە هیچ شارێك نامێنێتەوە.

مەنسور پێنووسی هەڵگرت و بۆ محەممەد کوڕی عەبدوالله‌ی نووسی: بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان. کەیفەر و سزای ئەو کەسانەی شەڕی خواوەند و پێغەمبەرەکەی دەکەن و خراپەکاری لەسەر زەوی دەکەنە پیشە، ئەوەیە بەسەختی کوشتار بکرێن یا لەدار بدرێن و دەست و پێیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێتەوە و لەشوێنی خۆیان، دوور بخرێنەوە. ئەم ریسواییە تایبەت بەوان، لەم جیهانەیە بەڵام لەو دنیا، ئەشکەنجەیەکی گەورە چاوەڕوانیان دەکات. مەگەر ئەو کەسانەی پێش ئەوەی دەستی ئێوە بەوان بگات، بۆ رێگەی خواوەند بگەڕێنەوە، بزانن کەخواوەند مێهرەبان و بەخشەرە. (مایدە/٥/٣٣- ٤٣). ئەمان و سوێند و پەیمانی خوایی و پێغەمبەرەکەی بەتۆ دەبەخشرێت کەتۆ لەگەڵ هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەت و شوێنکەوتەکانت بۆ خوێن و سامانەکان ئاسوودە بکەم و ئەو خوێنانەی رشتووتە و ئەو سامانانەی تالآنت کردووە، بەتۆی ببەخشم و جیاواز لەوە هەزار درەمت پێبدەم و نیازەکانت بەراوەردە و لەهەر شارێك کەبخوازیت، نیشتەجێ و هەموو زیندانییانی بنەماڵەکەت ئازاد بکەم. ئەمان بەو هەموو ئەو کەسانە دەبەخشم کەبەهەر شێوەیەك لەدەوری تۆ کۆبوونەتەوە و بەیعەتیان لەگەڵ کردوویت و هیچ کام لەوان سزا نادەم و بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە، شوێنپێیان هەڵناگرم. ئەگەر دەتەوێت دڵنیا بیت، هەرکەس کەدەخوازیت ڕەوانە بکە تا سوێند و بەڵێنەکانی خۆم بەودا ڕەوانە بکەم. ماڵئاوا.

محەممەد وەڵامی دایەوە: طسم. ئەمانە نیشانەکانی نووسراوی رێنیشاندەرن. بەشێك لەبەسەرهاتی فیرعەون و موسا بەراستی و دروستی بۆ تۆ دەخوێنینەوە تا خواپەرستەکان تێبگەن. فیرعەون لەسەر زەوی یاخیگەری کردە پیشە و خەڵکی جیهانی کردە شوێنکەوتە و کۆیلەی خۆی، بەشێوەیەك کەدەستەیەك لەوانی ریسوا و کوڕەکانی ئەوانی کوشتارو ژنانی

بەزیندووی هێشتەوە، ئەو یەکێك بوو لەخراپەکاران. بڕیارمانداوە بەخشینەکانی خۆمان بەسەر هەزارەگانی جیهاندا دابەش بکەین و بیانکەینە ڕێبەر و میراتی کەسانیتر بەوان بسپێرین. زەوی بۆ ئەوان تەخت و ئارام و ئەو بەلایە بەسەر فیرعەون و هامان و سوپاکەیدا بێنین کەلێی دەترسن. منیش هەمان بەڵێن و سوێند و پێشنیار بەتۆ دەگەم کەتۆ بەمنت کرد چوونکە خەلافەت بێ چەند و چوون ماڤ ئێمەیە و ئێوە لەبەر ڕووناکی و پیرۆزی ئێمە، خوازیاری بوون و بەهاوکاری و پشتیوانی ئێمە، لەخۆشییەکانی چێژ وەردەگرن. باوکی ئێمە یانی، عەلی، ڕێبەر و نوێنەری پێغەمبەر(د.خ) بوو. ئێستا کوڕەکانی ئەو زیندوون، ئێوە چۆن دەستتان بۆ سەر میراتی ئەو، ئاوەلا کردووە؟

جیاواز لەوە، تۆ دەزانی هیچ کام لەخوازیارانی ئەم کارە، نەژاد و گەورەیی بنەماڵەی ئێمەیان نەبووە و لەناوی چاکە و چاکەکاری باوکانیان، کەڵکیان وەرنەگرتووە. ئێمە لەبنەماڵە و نەژادی نفرین کراوەکان و ئازاد بووەکان نەبووین و هیچ کەس بەئەندازەی ئێمە پەیوەندی بەهێز و نزیکی لەگەڵ منداڵەکانی هاشمدا نەبووە. ئێمە منداڵەکانی دایکی پێغەمبەری خوایین کەفاتیمە کچی عەمرۆ لەرۆژگاری جاهلییە، لەرۆژگاری ئیسلامی ئێمە منداڵەکانی فاتیمەی کچی پێغەمبەرین کەئێوە لەگەڵ ئەودا بێگانەن. خواوەند ئێمەی بۆ فەرمانڕەوایی هەڵبژاردوە و فەرمانڕەوایی تایبەت کردووە بەئێمە. باوکی ئێمە لەناو پێغەمبەرەکان، محەممەدە، سلاوی خوای لێبێت کەرێزدارترینی پێغەمبەرانە. لەرابردوانی نەزۆر دوور، باوکی ئێمە، عەلی کوڕی ئەبی تالبە کەپێش هەمووان باوەڕی بەئیسلام هێنا. لەناو هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ)، دایکی ئێمە خەدیجەیە کەیەکەم نوێژکەری ڕووبە قیبلەیە. لەکچەکان، دایکمان فاتیمەیە کەشاژنی خاتوونەکانی سەرزەوی و سەروەری خاتوونەکانی بەهەشتە. لەمنداڵەکان کەسانی وەك حەسەن و حسەینمان هەیە کەسەروەرانی گەنجە بەهەشتییەکانن. هاشم دوو جار عەلی هێنایە دنیا و عەبدموتەلیب دووجار حەسەن و حسەین. پێغەمبەری خوا دووجار لەرێگەی حەسەن و حسەینەوە، منی هێنایە دنیا. من گەوهەری نێوەنجی هاشمییەکانم و کەچاکەکارترینی باوکەکان باوکی من و پاکترین نەژادەکان، تایبەتە بەمن. نەعەجەمەکان نەژادیان بەپاکی نەژادی منە و نە (دایکی منداڵەکان) بەتۆزی ڕێگەم دەگەنەوە. خواوەند بەردەوام لەرۆژگاری جاهلی و ئیسلام چاکترینی دایك و باوکەکانی بۆ هەڵبژاردم و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خراپەکاران، منی ڕەوانە کردووە. من لەبەهەشت، بەرزترین پێگەم پێدەبرێت و لەئەشکەنجەکانی دۆزەخ بێ

بەریم. ئەگەر گوێرایەڵی فەرمانەکانی من بیت و بانگەوازەکەی من پشتراست بکەیتەوە، بۆ سامان و گیانی خۆت، ئەمانت پێدەبەخشم و لەهەموو کارەکانت خۆش دەبم مەگەر لەو کاتانەی کەسنوورەکانی خواوەندنت بەزاندوە و ماف هەژارەکانت پێشێل کردووە.

من بۆ ئەم کارە لەتۆ شیاوترم و زیاتر پێبەندی پەیمانەکەی خۆم دەبم، تۆ ئەو سوێند و پەیمانە بەمن دەبەخشیت کەبەکەسانی پێش منت بەخشیوە. باسی کام ئەمان و پەیمانە دەکەیت؟ ئەمانی کوڕی هوبەیرە یا مامت عەبدواللە کوڕی عەلی یا ئەبوموسلیمی خوراسانی؟

کاتێك نامەکەی بەدەستی مەنسور گەیشت، باوکی ئەیووبی وەرنانی پێی وت: ڕێگە بدە وەڵامی بدەمەوە. وتی: نە. تۆ لەسەر بنەمای گومانەکانت، من بۆ شەر کردن لەگەڵ ئەو ناچار دەکەیت، ئەو کارە بەخۆم بسپێرە. پێنووسی هەڵگرت و نووسی: بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان، دوای سڵاو، نامەکەی تۆم بەدەست گەیشت. دەبینم بەشی زۆری شانازی کردنی تۆ بەژنەکانە لەبەر ئەوەی دەتەوێت بێ سەروپێ و هەژارەکان فریو بدەیت و پەیوەستی خۆتیان بکەیت. خواوەند بۆ ژنان ئەو پێگەی لەبەر چاو نەگرت کە بۆ مام و ئامۆزاکان، لەبەرچاوی گرت. هەروەها پەیوەندی خزمایەتی لەرێگەی باوکەوە پێش هەموو خزمایەتییەکان خست، چوونکە مام باوکی دەناسی و پێش لەبیرهێنانەوەی ژن، گفتوگۆی لەگەڵ کرد. ئەگەر خواوەند ژنانی لەسەر بنەمای خزمایەتی و نزیکی هەڵدەبژارد، ئامینە لەپێش هەموویان دەبوو و مافێکی گەورەتری پێدەبڕا و پێش هەموان دەڕۆشتە ناو بەهەشت. بەڵام خواوەند خەڵکانی لەسەر بنەمای زانستی خۆی سەبارەت بەوان و ئەو شارەزاییەی پێشتر لەوانی هەیە، هەڵدەبژێرێت.

ئەوەی سەبارەت بە فاتیمە، دایکی ئەبوو تالیب و منداڵەکانی ئەو هێناتە سەرزمان، دەبێت ئەوە بزانیت کەخواوەند هیچ کام لەمنداڵەکانی ئەو بەئیسلام ڕێزدار نەکرد. ئەگەر پیاوێك لەئیسلام بەهۆی نزیکی و خزمایەتییەوە، باوەڕدار دەبوو، خواوەند باوەڕی بە عەبدواللە دەبەخشی کەشیاوترینی خەڵکان بۆ هەموو چاکییەکان لەم دنیا و لەو دنیایە، بەڵام خواوەند، هەرکەسی بوویت بۆ دینەکەی خۆی هەڵیدەبژێرێت و بەئیسلام ڕێزی لێدەگرێت. خواوەند دەفەرمێت: تۆ ئەو کەسانەی کەدەتەوێت، ناتوانیت ڕێنوێنیان بکەیت، ئەوە لەدەسەڵاتی خواوەنددایە کەهەرکەسی بووێت، ڕێگەی نیشان دەدات و لەوان، ئاگادارترە. خواوەند، محەممەدی بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژارد. پێغەمبەر(د.خ)، چوار مامی هەبوو.

خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە کرد: نزیکترین کەسەکانی خۆت ئاگادار بکەرەوە. پێغەمبەر(د.خ)، ئەوانی بانگ کرد و پێشنیاری ئیسلامی پێکردن. دوان رازی بوون کەباوکی من، عەباس، یەکێکیان بوو. خواودند پەیوەندی خزمایەتی ئەم دووانەی پچڕاند و لەنێوان ئەم دووانە و منالەکانیان هیچ پەیوەندیەك نەما.

گومان دەکەیت زادەی کەم ئەشکەنجەترینی خەڵکان و کوڕی خراپترینی ئەوانیت. لەناباوەڕی بەخواوەند، ئاوز یا لەئەشکەنجەی خواوەند، سووك و ئاسانە یا لەناوەوە. باش و باشترین لەئارادا نییە و شیاو نییە بۆ هیچ خواپەرستێك کەشانازی بەجەهەننەمی بوونی خۆیەوە بکات. بەزووترین کات ئەوە دەبینیت و (ستەمکاران دەزانن بۆ چ شوێنێك دەگەڕێنەوە)

بەڵام بەسەرهاتی حەسەن و ئەوەی عەبدولوتلیب، دووجار ئەوی هێنایە دنیا و پێغەمبەر، تۆی دوو جار هێنایە دنیا، باشترینی خەڵکان کەپێغەمبەرە، هاشم زیاتر لەیەکجار و دواتر عەبدولوتەلیب، زیاتر لەیەکجار نەیهێنایە دنیا. گومان دەکەیت تۆ پاکترین و چاکترینی هاشمییەکان لەروانگەی دایك و باوکی کەعەجەمەکان تۆیان نەهێناوەتە دنیا و دایکانی منالّ، دایکی تۆ نین. بینیم لەبەرابەر هەموو هاشمییەکان، شانازیت بەخۆوە کرد. هاوار لەتۆ، بەیانی لەبەرابەر خواوەند، چ پێگەیەکت دەبێت! تۆ سنووری خۆتت بەزانە و لەبەرابەر کەسێك شانازیت بەخۆتەوە کرد کەلەروانگەی دایك و باوکەوە، لەتۆ لەپێشترە و ئەویش، ئیبراهیم کوڕی خواوەندە. باشترینی منالّەکانی بنەماڵەکەت و باشترینی خەڵکانی تایەفەکەت لەلایەن دایکانی منالّەوە، چاویان بەدنیا هەڵهێناوە. دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)، کەس بەرێزتر لەعەلی کوڕی حسەین، (ئیمامی چوارەمی شیعەکان) دەرنەکەوت و ئەویش لەلایەن دایکی منالّەوە، چاوی بەدنیا هەڵهێنا، ئەو لەباوەگەورێی تۆ، حەسەن کوڕی حەسەن، باشتر بوو، دوای ئەو لەناو ئێوە کەس بەرێزتر لەمحەممەد کوڕی عەلی (ئیمامی پێنجەمی شیعە) نییە بەڵام باوەگەورێی دایکی (لەدایکی منالّ) چاوی بەدنیا هەڵهێنا، ئەو لەباوکی تۆ باشترە، هەروەها کەس لەکوڕەکەی جەعفەر(ئیمامی شەشەمی شیعە) باشتر نییە کەئەویش لەتۆ باشترە.

بەڵام ئەوەی دەڵێیت: ئێمە منالّەکانی پێغەمبەری خوایین، خواوەند لەنووسراوەکەی خۆیدا دەفەرمێت: محەممەد باوکی هیچ کام لەپیاوەکانی ئێوە نییە بەڵکو پێغەمبەری خواوەند و دوایینی پێغەمبەرانە. ئێوە زادەی کچی ئەون هەرچەند ئەمە خزمایەتییەکی

نزیکە، بەلأم نابێتە هۆی ئەوەی میراتی فەرمانڕەوایەتی بەئێوە ببڕێت و ڕێبەری، لەم ڕێگەوە بەدەست نایەت. تۆ چۆن دەتوانی لەم ڕێگەوە، بەفەرمانڕەوایەتی بگەیت؟ باوکی تۆ، تەقەی لەهەموو ئەو دەرگایانەدا و فاتیمەی لەرۆژی ڕووناك هێنایەدەر و بەنهێنی پەرستاری لێکرد و لەشەوی تاریك، بەشێوەیەکی داپۆشراو بەخاکی سپارد بەلأم خەلك تەنیا بەو دوو بیرە رازی بوون. هەواڵی ڕاستمان لەپێغەمبەر پێگەیشتوە کەهەموو موسوڵمانەکان بۆ ئەم کارە شیاون، ئەم هەواڵە دەڵێت: باوەگەورێ کەباوکی دایك بێت، هیچ میراتێکی بەرناکەوێت و خاڵ و پووریش بەهەمان شێوە.

بەلأم ئەوەی شانازی بەپێشینەی عەلی دەکەیت لەئیسلامدا، دەبێت بزانیت ئەو کاتەی سەردەمی مردنی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، ئەو کەسێکی دیکەی بۆ پێشنوێژی کردنی خەڵکان هەڵبژارد. دواتریش یەك لەدوای یەك کەسانی دیکەیان وەك خەلیفە هەڵبژارد جگە لەو. لەشۆرای ڕاوێژ کردن یەکێك بوو لەڕاوێژکاران بەلأم کەس بەفەرمانڕەوایەتی ئەو رازی نەبوو و هیچ مافێکیان بۆ ئەو لەبەر چاو نەگرت.

عەبدولرەحمان، عوسمانی بەشیاوتر زانی و کەسێکی دیکەی بۆ فەرمانڕەوایەتی هەڵبژارد. زوبەیر و تەڵحە، بەیعەتیان لەگەڵ نەکرد و ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەویان گرتەبەر. سەعد رازی نەبوو پەیمانی لەگەڵ ببەستێت و درگای ماڵەکەی بەسەر ئەودا، داخست و دواتر لەگەڵ معاویە بەیعەتی کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت، ڕووی لەهەر ناوچەیەك کرد بەلأم هاوەلأنی لەدەوری ئەو بلأو بوونەوە و شوێنکەوتەکانی سەبارەت بەهەڵبژاردنی داوەر لەلایەن ئەو، گومانیان لا دروست بوو. دوو داوەریان هەڵبژارد و تەسلیمیان بوو و سوێند و پەیمانی خوایی پێدان کە بەفەرمانی ئەوان رازی دەبێت. ئەو دوو داوەرە، بۆ لەسەر کار لابردنی ئەو، ڕێککەوتن و ئەویان لەسەر تەختی خەلافەت هێنایە خوار. دوای ئەو حەسەن هاتە سەرکار و خەلافەتی بەچەند دەرەم و چەند دەست جل و بەرگی پیس و گلأو، بەمعاویە فرۆشت و بەرەو حیجاز بەرێکەوت و شوێنکەوتەکانی خۆی، پشتگوێ خست. فەرمانڕەوایی موسوڵمانانی بەکەسێك (معاویە) سپارد و خۆی دەستی بەسەر سامانە تالأنکراوەکاندا گرت. ئەگەر ماف فەرمانڕەوایەتیتان هەیە، پێشتر فرۆشتووتانە و بەهاکەیتان وەرگرتووە. دواتر مامەکەی تۆ، حسەین کوڕی عەلی، دژی کوڕی مەرجانە شۆرشی کرد، بەلأم خەڵك لەدەوری کوڕی معاویە کۆبوونەوە و دژی حسەین، جەنگان. سەری ئەویان بڕی و تەسلیمی کوڕی زیادیان کرد. دواتر، ئێوە دژی

ئومەوییەکان شۆڕشتان دەسپێکرد، بەڵام ئەوان کوشتار و لەناویان بردن و بەلقی دارخورماکانەوە، هەڵیانواسین و گرپیان تێبەردان و ئێوەیان لەشارەکان دەرپەڕاند تا ئەو کاتەی یەحیا کوڕی زیاد لەخوراسان کوژرا. ئومەوییەکان پیاوەکانیان کوشتن و ژن و منداڵەکانی ئێوەیان ئەسیر و ئەوانیان سوار وشتری بێ کۆپان کرد و هاوشێوەی کۆیلەکان لەبازارەکانی شام، فرۆشتیان تا ئەو کاتەی ئێمە بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئێوە، راپەڕین و کینەی دڵی ئێوەمان لەوان سەند و دادپەروەریمان کردەپیشە و سەرزەمینەکانی ئەوانمان وەك میرات بەئێوە سپارد و رێزمان لێگرتن. ئێستا تۆ دەتەوێت هەموو ئەم کارانە لەبەرژەوەندی خۆت و زیانی ئێمە کۆتایی پێبێنیت. گومان دەکەیت ئێمە باوکی تۆ بەگەورەتر و رێزدارتر لەعەباس و جەعفەر و حەمزە دەزانین بەڵام بەم شێوە نییە. ئەمە راست نییە، ئەوان تەندروست و تەسلیمی فەرمانەکانی خواوەند بوون و هاوشێوەی باوەڕداران، ماڵئاواییان لەجیهان کرد بەڵام باوکی تۆ خۆی گرفتاری شەڕ و کێشە کرد تا ئەو جێگەی ئومەوییەکان تا هەنووکەیش، نفرینی دەکەن بەڵام ئێمە رێگەی ئەو کارەمان لێگرتن و گەورەیی ئەومان، بیر خستنەوە و بەشێوەیەکی سەرسەختانە رووبەروویان بووینەوە و لەتۆڵەی ئیهانە کردنی عەلی، لەکوشتاری ئەوان، سنورمان بەزاند.

تۆ باش دەزانی رێزداری ئێمە لەرۆژگاری جاهلی، ئاودان بەحاجییەکان و پاسەوانی کردن زەمزەم بوو و ئەم کارە پیرۆزە، لەناو هەموو براکان، بەباوەگەورێی ئێمە، عەباس، سپێردرا. باوکی تۆ، لەسەر ئەو کارە دژایەتی ئێمەی کرد بەڵام عومەر لەزیانی ئەو و بەرژەوەندی ئێمە، کۆتایی بەکێشەکە هێنا. ئێمە بەردەوام لەرۆژگاری جاهیلی و ئیسلام، پاسەوانی کەعبە بووین. لەرۆژگاری ئیسلامی خەڵکانی مەدینە گرفتاری قاتوقڕی و وشکەساڵی بوون و عومەر تەنیا بەنێوەنجیگەری عەباسی باوەگەورێی ئێمەی، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و گرنگی بەباوکی تۆ نەدا، تا ئەوەی خواوەند دۆعاکەی گیرا کرد و بارانی باراند. باوەگەورێی تۆ ئامادە بوو بەڵام عومەر ئەوی نەکرد نێوەنجیگەری لەنێوان خۆی و خواوەند. تۆ باش دەزانی دوای پێغەمبەر(د.خ) هیچ کەس جگە لەباوەگەورێی ئێمە، لەکوڕەکانی عەبدولموتەلیب نەمایەوە و لەبەر ئەمە میراتەکەی ئەو بەمامی دەگات. دواتر کەسانێکی زۆر لەمنداڵەکانی هاشم بەدوای ئەم میراتەدا گەڕان بەڵام تەنیا منداڵەکانی عەباس توانیان ئەم کارە بگرنە دەست، کەواتە، ئاودانی حاجییەکان تایبەتە بەوان و میراتی پێغەمبەر(د.خ) و خەلافەت بۆ ئەو و منداڵەکانی ئەو. هیچ سەروەرێك لەرۆژگاری جاهیلی و

لەرۆژگاری ئیسلامی، نەمایەوە مەگەر ئەوەی عەباس، پشکێکی بەرکەوتبێت، ئەوەی وەك میرات بۆ مایەوە و وەك میرات بۆ منالەکانی خۆی بەجێیهێشت.

بەلام ئەوەی سەبارەت بەشەڕی بەدر ئاماژەت پێدا، بەم شێوەیە کاتێك ئیسلام دەرکەوت، عەباس خواردن و پۆشاکی بەمنالەکان و هاوسەرەکانی ئەبووتالب دەدا، چوونکە ئەو گرفتاری هەژاری و نەداری ببوو. ئەگەربەو شێوە نەدەبوو کە لەرۆژی شەڕی بەدر بەزۆر عەباسیان بۆ جەنگەکە برد بۆ ئەوەی دژی پێغەمبەری خوا، بجەنگێت، عەقیل و تالب لەبەرساندا دەمردن و قازانی بەتالیان دەلێسایەوە، بەلام ئەو رۆژیدەری خەلکەکەی بوو و لەم رێگەوە، رێگەی فریودانی ئێوەی گرت و زێر و درەم و دینارەکانی خۆی لەرێگەی ئێوەدا خەرج کرد. دواتر لەشەری بەدر بەهای ئازادی عەقیلیدا و ئازادی کرد. چۆن شانازی بەسەر ئێمەوە دەکەیت کە لەرۆژی شەڕی بەدر، بووینە هۆی رزگاری ئێوە و لەدیلی، رزگارمان کردن و دواتر تۆلەی خوێنی باوکانی ئێوەمان کردووە و لەم رێگەوە توانیمان فەرمانڕەوایی بگرینە دەست کەئێوە بۆ بەدەست هێنانی ناتەوان بوون و نەتانتوانی پارێزگاری لەخۆتان بکەن! سلاو و خۆشەویستی و بەزەیی خواوەند تایبەت بەئێوە بێت!

## درێژەی رووداوەکان

محەممەد، محەممەد کوڕی حەسەن کوڕی معاویە کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالبی وەك فەرمانداری مەککە دەستنیشان کرد، قاسم کوڕی ئیسحاقی بۆ فەرمانداری یەمەن، موسا کوڕی عەبدوالالەی بۆ فەرمانداری شام و لەناوچەکانی دیکە کەسانی دیکەی راسپارد، محەممەد کوڕی حەسەن و قاسم بەرێکەوتن. سەری کوڕی عەبدوالله کارگوزاری مەنسور لەمەککە، رووبەروویان بوویەوە و لەبەتن ئەزاخر، شەڕی لەگەڵ کردن و ئەم دووانەی شکستدا (یا ئەوان شکستیان پێهێنا).

محەممەد ڕۆشتە ناو مەککە و ماوەیەك لەو شارە مایەوە. دواتر نامەی محەممەد کوڕی عەبدواللەی بەدەست گەیشت کەفەرمانی پێدەدا لەگەڵ هاوەلانی خۆی بۆ هاوکاری ئەوان رەوانە ببێت. نووسی: عیسا کوڕی موسایان بۆ شەڕی من ڕەوانە کردووە. بەلام لەدەوری قەدید لەکوژرانی محەممەد ئاگادار بوویەوە. خۆی و هاوەلانی هەلاتن. محەممەد کوڕی حەسەن پەیوەستی ئیبراهیم بوو و تا کوژرانی ئیبراهیم، لەوێ مایەوە. قاسم لەمەدینە خۆی حەشاردا تا کچەکەی عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی

جەعفەر، هاوسەری عیسا، بۆ خۆی و براکەی (معاویە و کەسانیتر) ئەمانی وەرگرت.

موسا کوڕی عەبدوڵڵە، هاوڕێ لەگەڵ ڕەزام (کۆیلە یا موالی محەممەد کوڕی خالیدی قەسری) بەرەو شام بەڕێکەوت. ڕەزام زۆر لەسەر خۆ، ئەوی بەتەنیا جێهێشت و بەرەو دەرباری مەنسور ملی ڕێگەی گرتەبەر و نامەیەکی لەمحەممەد کوڕی قەسری، تەسلیم بەمەنسور کرد. محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە لەم کارە ئاگادار بوویەوە و محەممەد کوڕی قەسری خستە زیندانەوە. موسا گەیشتە شام و پەچەکردارێکی توندی لەخەڵکانی شام بینی، لەبەر ئەمە نامەی بۆ محەممەد نووسی: لەگەشتنی خۆم بۆ شام و چاوپێکەوتن و بینینی خەڵکەکەی ئاگادارت دەکەمەوە. قسە خۆشترینی ئەوان کەسێك بوو کەوتی: سوێند بەخوا لەزیانە بەردەوامەکان، بێزار و دڵتەنگ بووین تا ئەو جێگەی بۆمان دەرکەوت هیچ پێگەیەك و نیازێکمان بەم کارە نییە. لەناو ئەوان کەسانێك دەبینران سوێندیان دەخوارد ئەگەر ئەمشەومان لێ بڕوات، بێ هیچ گومانێك نهێنییەکەمان ئاشکرا دەبێت. من خۆم داشارد و لەگیانی خۆم ترسام. بۆ مەدینە گەڕایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو، ڕۆشتە ناو بەسرە و هاوڕێکەی خۆی نارد تا خواردن و پێداویستییەکانی بۆ بێنێت. هاوڕێکەی، خواردنی کڕی و باری چوارپێیەکی ڕەشی کرد و بردییە ئەو ماڵەی ئەوان تیایدا نیشتەجێ بوون. زۆری نەخایاند ماڵەکە دەوری گیرا و موسا و کوڕەکەی، عەبدوڵڵە، لەگەڵ کۆیلەکەی، دەستگیر کران. ئەوانیان گرت و تەسلیم بەمحەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵەیان کرد. کاتێك موسای بینی، وتی: خواوەند پەیوەندی خزمایەتی نێوانمان بەهێز نەکات و ڕێزتان لێنەگرێت. هەموو شارەکانت بەجێهێشت و هاتیتە ئەو شارەی من تیایدا نیشتەجێم، ئەگەر ڕێز لەپەیوەندی خزمایەتی بگرم دەبێتە هۆکاری تووڕە بوونی سەروەری باوەڕداران و ئەگەر فەرمانەکانی ئەو ئەنجام بدەم، بنەماڵەی ئێوەم، لەناو بردووە. ئەوانی بۆ لای مەنسور، ڕەوانە کرد. مەنسور وتی: هەموو گومڕاکانت ڕووسپی کرد! ئەوان چییان بەسەردێت! موسا وتی: ناخ پاکان و خواپەرستان بۆ خۆڕاگری شیاوترن. فەرمانی زیندانی کردنی ئەوانی دەرکرد.

## بەرێکەوتنی عیسا کوڕی موسا بۆ شەڕی محەممەد

### کوژرانی محەممەد کوڕی عەبدوالله

مەنسور، عیسا کوڕی موسای کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، برازای خۆی، بانگ کرد و فەرمانی پێدا بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ محەممەد بەرەو مەدینە بەرێکەوێت.، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەگەڵ مامەکانی خۆت کۆبوونەوە ئەنجام بدە و راوێژیان لەگەڵ بکە. دواتر وتی: هۆنراوەکەی هەرسمە چی بەسەر دێت:

| | |
|---|---|
| نزور امرا لا يمحض القوم سره | و لا ينتجى الادنين عما يحاول |
| اذا ما اتى شيئا مضى كالذى اتى | و ان قال انى فاعل فهو فاعل |

یانی: دەرۆینە بینینی پیاوێك کەنهێنی خۆی لەگەڵ خەڵکان باس ناکات وئەوەی دەیەوێت، ئەنجامی دەدات و لەبەرابەر کەسانی خۆی مل نادات. کاتێك مەبەستی ئەنجامدانی کارێك بکات، بەخێراییەکی ئەوتۆ بەرێدەکەوێت، وەك بڵێی، پێشتر ئەو کارە ئەنجام دراوە و کاتێك دەڵێت کەمن بکەری کارێکم، بەراستی ئەو کارە ئەنجام دەدات و کۆتایی پێدێنێت.

مەنسور وتی: ئەی پیاو، بەرێکەوە چوونکە تەنیا من و تۆیان دەوێت (دەیانەوێت من و تۆ لەناو ببەن). ئێستا تەنیا یەك رێگە ماوەتەوە یا ئەوەی تۆی بەرێکەوێت یا من. ئەو، لەگەڵ سوپاییەکان بەرێکەوت. کاتێك بەرێکەوت، مەنسور وتی: ترسم لەوە نییە کام یەك لەم دووانە  ئەوی دیکە بکوژێت. لەگەڵ ئەودا، محەممەد کوڕی ئەبی عەباس، عەبدوالله‌ی سەفاح، کەسیر کوڕی حوسەینی عەبدی، کوڕی قەحتەبە، هەزار پیاو و کەسانی دیکەی، ڕەوانە کرد. کاتێك ویستی ماڵئاوایی لێبکات، پێی وت: ئەی عیسا، من، تۆ بۆ دەرکەوتنی دیاردەیەکی لەم شێوەیە، ڕەوانە دەکەم، هەردوو لای کەلەکەی نیشاندا ((یانی من بۆ شەڕی کەسێك تۆ ڕەوانە دەکەم کەبەئەندازەی چاوم خۆشەویستە). ئەگەر بەسەر ئەم پیاوەدا سەرکەوتیت، شمشێرەکەت بخەرە کالأن و ئەمانیان پێببەخشە. ئەگەر خۆی داشارد، بەڵێنی و پەیمانی پێبدە، لەبنەماڵەی ئەبووتالب هەرکەس هاتە سەردانی تۆ، ناوی بنووسە و هەرکەس نەهات، دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرە.

جەعفەری سادق( ئیمامی شەشەمی شیعەکان) سەردانی نەکرد و عیسا دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت. کاتێك مەنسور ڕۆشتە مەدینە، جەعفەر سەبارەت بەسامانی خۆی، قسەی لەگەڵ کرد تا سامانەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە. مەنسور وتی: مەهدی خۆتان، دەستی بەسەردا گرت.

کاتێك عیسا گەیشتە فید، نامەی بۆ خەڵکان نووسی. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: عەبدولعەزیز کوڕی موتەلیبی مەخزومی کوڕی محەممەد کوڕی سەفوانی جەحی. بۆ عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب نامەی نووسی تا لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی لەمەدینەوە بەڕێکەوێت. ئەو، لەگەڵ ئەم کەسانە بەڕێکەوت: عومەر کوڕی محەممەد کوڕی عومەر، باوکی عەقیل محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەقیل و باوکی عیسا.

کاتێك محەممەد لەنزیك بوونەوەی عیسا لەمەدینە ئاگادار بوویەوە، ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵانی خۆی کرد بۆ ئەوەی بزانێت لەناو شارەکەدا بمێنێتەوە یا بڕواتەدەر. دەستەیەك بۆچوونیان وابوو لەشارەکە بڕواتەدەر و دەستەیەك وتیان، بمێنێتەوە چوونکە پێغەمبەر(د.خ) فەرموو بووی: لەخەودا بینیم کەزرێیەکی ئەستوورم پۆشیوە، بەم شێوەیە لێکدانەوەدم بۆ خەوەکەی خۆم کرد کەمەبەست لێی، مەدینەیە. دواتر لەگەڵ ئەسحابەکان ڕاوێژی کرد تا خەندەقی پێغەمبەر(د.خ)، هەڵکەنن. جابر کوڕی ئەنس سەزوەری سەلیم پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئێمە خاڵوان و دراوسێکانی تۆین و خواردن و کەل و پەلی پێویست و چوارپێ و باڵندە لەناو ئێمەدا فراوانە، خەندەك هەڵمەکەنە چوونکە پێغەمبەر(د.خ) بۆ کارێك خەندەکی هەڵکەند کەخوا لێی ئاگادارە. ئەگەر خەندەك هەڵکەنیت، پیادەکان بەباشی شەڕیان بۆ ناکرێت و سوارەکان، لەناو کۆڵانەکان، ناتوانن، جەنگ تاقیبکەنەوە. ئەو کەسانەی لەهەڵکەندنی ئەم خەندەکە زیانیان بەردەکەوێت، ئەو کەسانەن کەخەندەکە، دەورەیان دەدات و دەست وپێی ئەوان دەبەستێتەوە. یەکێك لەپیاوەکانی بنەماڵەی شوجاع وتی: خەندەکی پێغەمبەری خوا هەڵکەندە و ڕێگەی ئەو بگرەبەر. ئایا دەتەوێت گرنگی بەنیشانەکانی پێغەمبەر(د.خ) نەدەیت. جابر وتی: ئەی کوڕی شوجاع، سوێند بەخوا هیچ شتێك بۆ تۆ و هاوەڵانت لەڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان دژوارتر نییە و هیچ شتێك لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەوان، بۆ

ئێمە ئاسانتر نییە. محەممەد وتی: ئێمە بۆهەڵکەندنی خەندەك، شوێنی کارەکەی پێغەمبەر(د.خ) دەگەوین و کەس ناتوانێت رێگەمان لێبگرێت. فەرمانی هەڵکەندنی خەندەك و خۆی دەستی بەکار کرد. هەمان خەندەکیان هەڵکەندەوە کەپێغەمبەر لەشەڕی خەندەك، هەڵیکەند.

عیسا بەرێکەوت تا لەئەعوەس دابەزی. محەممەد خەڵکانی کۆکردەوە و پەیمانی لێوەرگرتن و رێگەی نەدان شارەکە بەجێبێڵن. محەممەد کوڕی عەبدوالله قسەی بۆ کردن و وتی: دوژمنی خواوەند لەسەرزەمینی ئەعوەس دابەزیوە. شیاوترینی خەڵکان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان، منالی ئەنسار و موهاجیرەکانن. ئاگاداربن ئێمە ئێوەمان کۆکردەوە و پەیمانمان لێوەرگرتن. ژمارەی دوژمنان فراوان و سەرکەوتن لەدەستی خوادایە و کارەکانی من بەفەرمانی ئەو. بەباشم زانی ئێوە سەرپشك بکەم. هەرکەس دەخوازێت بمێنێتەوە، بمێنێتەوە و هەرکەس دەخوازێت، بڕوات، بڕوات.

دەستەیەکی فراوان لەخەڵکان لەگەڵ ژن و منالەکانی خۆیان بەرەو کوێستانەکان و گوندەکانی دەوروبەر، بەرێکەوتن. محەممەد لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەخەڵکان مایەوە. فەرمانی بەباوکی قەلەمەسدا بۆ ئەوەی ئەگەر دەتوانێت، خەڵکان لەڕۆشتن پەشیمان بکاتەوە.

مەنسور، کوڕی ئەسەمی لەگەڵ عیسا نارد. کاتێك گەیشتنە یەکی میلی مەدینە، دابەزین. کوڕی ئەسەم وتی: سوارەکان لەبەرابەر پیادەکان، ناتوانن هیچ کارێك بکەن، دەترسم ئەگەر هێرش بکەنە سەر ئێوە بتوانن ریزەکانی ئێوە بشکێنن. ئەوان بۆ ئەستێلکی عەبدولەلیك کوڕی مەروان، پاشەکشێیان کرد و لەجۆرف، لەچوار میلی مەدینە، دابەزین. عیسا، پێنسەد پیاوی شەڕکەری بەرەو بەتحاری باوکی ئەزهەر لەشەش میلی مەدینە ڕەوانە کرد تا لەوێ دابەزن. فەرمانی ئامادە باشی پێدان بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست گەمارۆ بخەنە سەر شارەکە. ئەم پێنسەد کەسە لەشوێنی خۆیان مانەوە تا ئەو کاتەی محەممەد، کوژرا.

عیسا پەیك و پەیامی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوالله نارد و ئاگاداری کردەوە کەمەنسور، ئەمانی بەخۆی و بنەماڵەکەی بەخشیوە. وەڵامیدایەوە: ئەی پیاو، تۆ پەیوەندی خزمایەتیت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)دا هەیە و من پێشنیاری گەڕانەوە بۆ

نووسراوی خواوەند و شێوازی پێغەمبەر و فەرمانبەری کەسێکت پێدەکەم و لەتوڕەیی و ئەشکەنجەی ئەو ئاگادارت دەکەمەوە. هۆشیاربە، باکەس تۆ نەکوژێت چوونکە دەبیتە خراپترین کوژراو و ئەگەر کەسێك بکوژیت، بارێکی قورست لەسەر شان دەبێت. کاتێك پەیامەکەی بەعیسا گەیشت، وتی: تەنیا شەڕ لەنێوان ئێمەدا داوەری دەکات. محەممەد بەنێردراوی وت: من پیاوێکم لەترسی کوژران، هەڵاتووم، بۆ دەمکوژن؟ نێردراو وتی: ئەوان دەیانەوێت ئەمانت پێببەخشن، ئەگەر تۆ ڕێگەی ناسازگاری نەگریتەبەر، لەسەر هەمان بنەما شەڕت لەگەڵ دەکەن کەباوکی تۆ، لەسەر ئەو بنەمایە، شەڕی لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر کرد چوونکە ئەو دووانەیش پەیمانی خۆیان شکاند و سوێندەکەی خۆیان پچڕاند و دژایەتی کردنی سەروەری خۆیان کردەپیشە. کاتێك مەنسور، قسەکەی ئەوی بیست، وتی: هەرگیز شاد نەدەبووم ئەگەر جگە لەم وتەیە، وتەیەکی دیکەی دەهێنایە سەرزمان.

عیسا ڕۆژی شەممە، دوانزە ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەمەزان/ ٤ دێسامبەری ٧٦٢ زایینی، گەیشتە جۆرف و لەناوچەیە، دابەزی. ڕۆژی شەممە و یەکشەممە، وچانی گرت و بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممە بەڕێکەوت و گەیشتە سەرەوەی سەلع و سەیری مەدینەی کرد. هاواری کرد: ئەی خەڵکانی مەدینە، خواوەند خوێنی ئێمەی بۆ یەکتر ناڕەوا کردووە، ئالآی ئەمان هەڵکراوە، لەدەوری کۆببنەوە. هەر کەس بێتە ژێر ئەم ئالآیە، ئەمانی پێدەبەخشرێت، هەرکەس لەناو ماڵەکەی خۆیدا بمێنێتەوە، ئەمان بەخشراوە، هەرکەس بڕواتە ناو مزگەوت، ئاسوودەیە، هەرکەس کەل و پەلی شەڕ فڕێبدات، زیانی پێناگات و هەرکەس لەمەدینە بڕواتەدەر، پارێزراوە. ئێمە لەگەڵ هاورێکانی خۆمان بەتەنیا جێبێڵن بۆ ئەوەی شەڕ یا لەبەرژەوەندی ئێمەدا بێت، یا لەبەرژەوەندی ئەو. ئەو ڕۆژە گەڕایەوە و بەیانی ئەو ڕۆژە، فەرماندەکانی خۆی بۆ چواردەوری مەدینە ڕەوانە کرد بەڵام گەڕەکی مزگەوتی باوکی جەراحی نەگرت بۆ ئەوەی هەڵاتوان بتوانن لەوێوە خۆیان دەرباز بکەن. محەممەد لەگەڵ هاوەڵانی دەرکەوت. ئالآکەی لەدەستی عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی خالید کوڕی زوبەیردا بوو. دروشمەکەی بریتی بوو لە: ئەحەد، ئەحەد. باوکی قەلەس لەناو هاوەڵانی محەممەد هاتەدەر. براکەی ئەسەد ڕووبەڕووی بوویەوە. شەڕیان کرد و باوکی قەلەس، ئەوی کوشت، کەسێکی دیکە هاتەدەر و دووبارە

لەسەردەستی ئەو کوژرا. کاتێك لێیدا وتی: بیگرە، من کوڕی فاروقم. یەکێك لەهاوەڵانی عیسا وتی: پیاوێکی باشتر لەهەزار فاروقت کوشت.

محەممەد لەو رۆژەدا بوێرانە شەڕی کرد و بەدەستی خۆی نزیکەی حەفتا کەسی کوشت. عیسا بەحەمید کوڕی قەحتەبە، فەرمانی بەرێکەوتنیدا. ئەو، لەگەڵ سەد شمشێروەشێن کەهەموویان پیادە بوون، بەرێکەوتن. پێشڕەویان کرد تا گەیشتنە دیوارێك لەسەروی خەندەکە کەشەڕکەرانی محەممەد، پارێزگاریان لێدەکرد. حەمید دیوارەکەی بڕی و خۆی گەیاندە خەندەکەکە. دەرگایان لەسەردانا و لەگەڵ هاوەڵانی پەڕینەوە و گەیشتنە ئەوبەری خەندەکەکە و تا نزیك نوێژی ئێواری شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد. عیسا فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا توێشوودان و بەرد و خست و خەوش و خۆڵیان فڕدایە ناو خەندەکەکە و تا نیوە پڕیان کردەوە و دەرگاکانیان لەسەر جێگیر کرد. سوارەکان پەڕینەوە و شەڕیان دەستپێکرد. محەممەد پێش نیمەڕۆ گەڕایەوە و سەروروخساری شۆر عەبدولرەحمان و بۆنی خۆشی لەخۆیدا و بۆ گۆڕەپانی شەڕ گەڕایەوە. عەبدوالله جەعفەر وتی: دایك و باوکم بەقوربانی تۆبن! سوێند بەخوا ناتوانیت هیچ کارێك بکەیت. باشترە بۆ لای حەسەن کوڕی معاویە لەمەککە بڕۆیت چوونکە زۆربەی هاوەڵانت لەوێن. وتی: ئەگەر بڕۆم، هەموو خەڵکانی مەدینە کوشتار دەکەن. سوێند بەخوا ناگەڕێمەوە یا دەکوژم یا دەکوژرێم. تۆ، هیچ پەیمانێکی منت لەئەستۆدا نییە، بۆ کوێ دەخوازیت بڕو.

کەمێك لەگەڵ ئەودا ڕۆشت و دواتر گەڕایەوە. زۆربەی هاوەڵانی بەجێیان هێشت تا ئەو رادەی نزیکەی سێسەد کەسی لەگەڵدا مایەوە. بەیەکێك لەهاوەڵانی خۆی وت: ژمارەی ئێمە ئەمڕۆ بەرابەرە لەگەڵ ژمارەی شەڕکەرانی بەدر. محەممەد نوێژی نیمەڕۆ و ئێوارێی خوێند. عیسا کوڕی خوزەیرهاورێیەتی دەکرد و بەردەوام سوێندی دەدا تا بەرەو بەسرە یا ناوچەیەکی دیکە بڕوات. محەممەد دەیوت: سوێند بەخوا دووجار گرفتاری من و چارەنووسی من نابن، بۆ کوێ دەخوزایت، بڕۆ. کوڕی خوزەیر وتی: چۆن دەتوانم بەجێت بێڵم؟ بەرێکەوت و ئەو دەفتەرەی سووتاند کەناوی هاوەڵانی محەممەدی تیا نووسرابوو. لەگەڵ ریاح کوڕی عوسمان و براکەی عەباس کوڕی موسلیم بەسەختی شەڕی کرد و کوڕی موسلیم کوڕی عوقەبەری موری کوشت. دواتر بەرەو زیندان بەرێکەوت تا

محەممەد کوڕی قەسری لەزینداندا بکوژێت بەڵام محەممەد ئاگادار بوویەوە و دەرگاکانی بەهێز کرد. کوڕی خوزەیر نەیتوانی دەرگای زیندان بکاتەوە، لەبەر ئەمە بۆ لای محەممەد گەڕایەوە و هاوکاری کرد تا ئەو کاتەی کوژرا.

حەمید کوڕی قەحتەبە پێشڕەوی دەستپێکرد و رووبەرووی محەممەد بوویەوە. کاتێك بەرێکەوت و سەیری ئاوڕۆی سەلعی کرد، ئەسپەکەی خۆی کوشت. منداڵەکانی شوجاع بەدوای ئەو، ئەسپەکانی خۆیان کوشت و هەموویان کاڵانی شمشێرەکانی خۆیانیان شکاند. محەممەد بەوانی وت: ئێوە پەیمانتان لەگەڵ من بەستوە. من یەك پەنجە لەشوێنەکەی خۆم پاشەکشێ ناکەم تا دەکوژرێم. هەرکەس دەخوازێت، گۆڕەپانی شەڕ بەجێبێڵێت، ئازادە.

شەڕ بەردەوام رووی لەدژواری دەکرد. ئەوان، دوو یا سێ جار شەڕکەرانی عیسایان تێکشکاند. یەزید کوڕی معاویە کوڕی عەباس کوڕی جەعفەر وتی: ئەی هاوار لەدایکی، سەرکەوتنێکی گەورە و شکۆدار دەبوو ئەگەر بۆ پاراستنی، شەڕکەری پێویستی لەگەڵدا دەبوو. چەند کەسێك لەشەڕکەرانی عیسا رۆشتنە سەر کێوی سەلع و لەوێوە بەرەو مەدینە شۆڕ بوونەوە. ئەسماء کچی حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەباس فەرمانیدا روپۆشێکی سپی بۆ بێنن. هێنایان و لەسەر گولدەستەی مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ)، هەڵیانواسی. هاوەڵانی محەممەد وتیان: مەدینە دەستی بەسەردا گیرا. هەڵاتن. یەزید وتی: هەر دەستەیەك، کێوێکیان هەیە کەپارێزگاریان لێدەکات. کێو وپارێزەری ئێمە، ئەمەیە کەکەس ناتوانێت دەستی بەئێمە بگات. مەبەستی کێوی سەلع بوو.

منداڵەکانی باوکی عەمرۆی غەفاری لەناو منداڵەکانی غەفار، بۆ هاوەڵانی محەممەد رێگەیەکیان کردووە کەلێوە تێپەڕین و لەپشت هاوەڵانی محەممەد، هاتنەدەر. محەممەد، بانگی حەمید کوڕی قەحتەبەی کرد: بۆ لای من وەرە، من منداڵەکانی ئیسرائیل کوڕی عەبدوڵلەم. وەڵامیدایەوە: تۆم ناسییەوە، تۆ گەورەیت و گەورە نەژادا سوێند بەخوا تا ئەم بێ سەر و پێیانە لەناو تۆدابن، بۆ لای تۆ نایەم. کاتێك لەوان تەواو بووم، لەتۆ نزیك دەکەومەوە.

حەمید بەردەوام پێشنیاری ئەمانی بەکوڕی خوزەیر دەدا و لەمردن ئاگاداری

دەكردەوە. كوڕی خوزەیر بەردەوام پەلاماری شەڕكەرانی دەدا و پیادە، شەڕی دەكرد و گرنگی بەوتەكانی حەمید نەدەدا. پیاوێك لەشەڕكەرانی عیسا شمشێرێكی لەسمتیدا و هەڵیقڵیشت. كوڕی خوزەیر بۆ لای هاوەڵانی گەڕایەوە و شوێنی شمشێرەكەی بەپارچەیەك بەست و بۆ گۆڕەپانی شەڕ گەڕایەوە. پیاوێك شمشێری لەچاویدا كەتیایدا چەقی و لەئەسپەكەی كەوتەخوار. دواتر دەستەیەك هێرشیان كردەسەری و سەریان بڕی. لەبەر فراوانی برینەكانی، جەستەی هاوشێوەی بێژنگ بوو. شەڕكەرێكی وەك ئەو بۆ بووێری نەدەبینرا مەگەر حەمزە. بەردەوام شەڕی دەكرد تا ئەوەی پیاوێك شمشێری لەنەرمەی گوێچكەی راستیدا و كەوتە سەر ئەژنۆ، بەو حاڵەشەوە، بەرگری لەخۆی دەكرد و بەردەوام دەیوت: هاوار لەئێوە! كوڕی پێغەمبەرەكەتان بریندارە و زیانی پێگەیشتوە! كوڕی قەحتەبە، رمێكی لەسەر سینەی چەقاند و ئەوی خستە سەرزەوی و دواتر لەئەسپەكەی هاتەخوار و سەری بڕی و بردی بۆ لای عیسا بەڵام ئەوەندە خوێنی لێهاتبوو كەنەدەناسرایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: عیسا سەركۆنەی كوڕی قەحتەبەی كرد چوونەكە ئەو سەركردەی سوارەكان بوو. پێی وت: دڵنیام بەهەموو هێزی خۆت شەڕ ناكەیت. وتی: ئایا گومان لەمن دەكەیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر چاوم بەمحەممەد بكەوێت، باڵ دەگرم و شمشێر بارانی دەكەم. دەڵێت: لای محەممەد تێپەڕی و بینی كوژراوە بەڵام شمشێرێكی لێدا بۆ ئەوەی سوێندەكەی بەدیهێنابێت.

دەستەیەك دەڵێن: لەو كاتەی سەرقاڵی شەڕ كردن بوو، تیرێكیان بۆهاویشت كەلەجەستەی چەقی. رووی كردە دیوارێك و پشتی پێبەست. خەڵكان و شەڕكەران لەدەوری كۆبوونەوە وپارێزگاریان لێدەكرد. كاتێك بینی، باڵندەی مەرگ بەدەوری سەریدا دەسووڕێتەوە، شمشێری دەرهێنا و لەبەردێكیدا و شكاندی. هەمان شمشێر بوو كە لەعەلی كوڕی ئەبی تالب بۆی مابوویەوە. دەستەیەك دەڵێن: بەوشێوە نەبوو، بەڵكو شمشێرەكەی بەیەكێك لەبازرگانەكان هاورێیدا كەچوارسەد دیناری قەرزار بوو. پێی وت: ئەم شمشێرە بگرە چوونكە سوێند بەخوا ئەگەر هەركام لەمناڵەكانی عەلی كوڕی ئەبی تالب ببینی و شمشێرەكەی نیشان بدەیت، قەرزەكەی تۆ دەداتەوە. شمشێرەكە لەدەستی ئەو پیاوەدا مایەوە تا ئەو كاتەی جەعفەر كوڕی سلێمان فەرمانداری مەدینەی گرتەدەست و

لەشمشێرەکە ئاگادار بوویەوە. شمشێرەکەی لەپیاوەکە وەرگرت و چوارسەد دینارەکەی بۆ گەڕاندەوە. شمشێرەکە لای ئەو مایەوە تا ئەوکاتەی مەهدی لێیوەرگرت و دوای ئەو بەهادی گەیشت کەکێشای بەبەردێکدا و شکاندی. دەستەیەك دەڵێن: بەوشێوە نەبوو بەڵکو تا رۆژگاری هارون ئەڵرەشید مایەوە. هارون بەردەوام شمشێرەکەی لەکەمەر بەست کەهەژدە دیانەی هەبوو.

کاتێك سەری محەممەدیان بۆ عیسا برد، بەهاوەڵانی خۆی وت: سەبارەت بەو چی دەڵێن؟ ئەوان، زمانیان بۆ سەرکۆنە کردنی کردەوە. یەکێك لەوان وتی: درۆتان کرد. لەبەر ئەوە شەڕمان لەگەڵ نەکرد، بەڵکو لەبەر ئەوە شەڕمان لەگەڵ کرد چوونکە نافەرمانی فەرمانی سەروەری باوەڕدارانی کرد و یەکیەتی خەڵکانی لەناوبرد. ئەو پیاوێك بوو بەزۆری رۆژووی دەگرت و شەوەکانی بەنوێژ و پاڕانەوە بەسەر دەبرد. خەڵکان بێدەنگ بوون و قوڕوقەپیان لێکرد. عیسا، سەری محەممەدی بە محەممەد کوڕی ئەبی کەرام کوڕی عەبدوالله کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب بۆ مەنسور نارد و هەواڵی سەرکەوتنی بەقاسم کوڕی زەید کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، بۆ دەرباری مەنسور، ڕەوانە کرد. مەنسور فەرمانیدا و سەری ئەویان کرد بەڕمەوە و لەکۆڵان و گەڕەکەکانی کوفەدا، گەڕاندیان. دواتر بۆ کەنارەکانی ئیمپراتۆری عەرەبەکانی نارد و ژەهری سەرکوت کردنی خۆی بەوان نیشاندا. کاتێك مەنسور سەری براوی منداڵەکانی شوجاعی بینی، وتی: بەمشێوەیە دەبێت خەڵکان کوشتار و سزا بدرێن. من بەدوای محەممەددا دەگەڕام و ئەوان، پشتیوانیان لێکرد. شان بەشانی ئەو شەڕیان کرد تا ئەوەی هەموویان کوژران.

محەممەد و هاوەڵانی رۆژی دووشەممە لەکاتی نوێژی ئێوارێ، چواردە رۆژی یەکەمی مانگی رەمەزان/ ٦ دێسامبەری ٧٦٢ زایینی، کوژران. پێشتر مەنسوریان ئاگادار کردبوویەوە کەفەرماندەی سوپاکەی ئەو، عیسا، شکستی خواردوە. وتبووی: هەرگیز، ئەی ئەو کاتانە چییان بەسەر دێت کەمنداڵەکانی ئێمە دەچنە سەر تەختی وتاردان و گەمە بەچارەنووس دەکەن و ژنە جوان روخسارەکان دەکەنە راوێژکار و هاودەمی خۆیان. من هێشتا ئەو پێگەیەم بەدەست نەهێناوە. دواتر ئاگاداریان کردەوە کەمحەممەد هەڵاتوە. لەم کاتەدا وتی: بەڵێ، بەوشێوە نییە، ئێمە لەو بنەماڵەین کەهەڵاتن دەکەینە پیشە. باشتر بوو

سەری براوی ئەویان بەدیاری دەهێنا بۆمان.

کاتێك سەری محەممەدیان بردە لای مەنسور، حەسەن کوڕی زەید کوڕی حەسەن، لای ئەو بوو. کاتێك سەری محەممەدی بینی، ئەو دیمەنەی بەلاوە ناخۆش و گران بوو بەڵام لەترسی مەنسور هیچی نەوت: بەهاوەڵەکەی مەنسوری وت: خۆیەتی؟ وتی: ئەو جەرگی ئەوانە. دووبارە وتی: من حەزم دەکرد مەنسور فەرمانڕەوایەتی بکات و بەردەوام ئارەزوم دەکرد، محەممەد نافەرمانی نەکردبێت. ئەگەر جیاواز لەمە بێت، هاوسەرەکەم تەڵاقی کەوتبێت. گیانی ئەو لای ئێمە، بەرێزتر لەم گیانەیە. یەکێك لەکۆیلەکانی تفی تێکرد. مەنسور فەرمانیدا لەتاوانی ئەم وتارەی، لووتی بشکێنن.

کاتێك هەواڵی کوژرانی محەممەد لەبەسرە، بەئیبراهیمی برای گەیشت، رۆژی جەژنی رەمەزان بوو. ئیبراهیم، هاتەدەر و لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند. ڕۆشتە سەر تەختی وتاردان و شین و ڕۆڕۆی دەستپێکرد. ئەم هۆنراوەی یەکێك لەشاعیرەکانی هێنایە سەرزمان:

ابا المنازل یا خیر الفوارس من      یفجج بمثلك فی الدنیا فقد فجعا

الله یعلم انی لوخشیهم      و أوجس القلب من خوف لهم فزعا

لم یقتلوه و لم اسلم اخی ابدا      حتی نموت جمیعا او نعیش معا

یانی: ئەی باوکی بنەماڵە رێزدارەکان، ئەی باشترین پیاوی سوارکارەکان، هەرکەس لەم جیهانە لەمەرگی تۆ داغدار بێت، شیاوی ئەوەیە، داغدار بێت. خواوەند دەزانێت کەئەگەر من لەوان دەترسام، و ئەگەر دڵم لەترسی ئەوان لێوانلێو دەبوو، ئەوان، هەرگیز ئەویان نەدەکوشت و من براکەم تەسلیمی ئەوان نەدەکرد و بەتەنیا جێم نەدەهێشت تا ئەوەی هەموومان پێکەوە باوەشمان بۆ مەرگ دەکردەوە یا سەرفرازانە، رێگەی ژیانمان دەگرتەبەر.

کاتێك محەممەد کوژرا، عیسا ئاڵاکانی ڕەوانە کرد تا لەشوێنە جیاجیاکانی مەدینە، هەڵیان بکەن. جاڕچییەك جاڕیدا: هەرکەس پەنا بۆ ژێر ئاڵایەك ببات، ئەمانی پێدەبەخشرێت. هاوەڵانی محەممەدی گرت و ئەواتی لەسەر تەپۆڵکەی ماڵئاوایی تا ماڵی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز لەدوو رەدە، لەسێدارەدا. کوڕی خوفەیری کردە پاسەوانی سێدارەکان تا پارێزگاریان لێبکات. کەسانێك دەرکەوتن کەجەستەی ئەویان شەوانە بەخاك

سپارد. کەسانی دیکەیان تا سێ ڕۆژی دواتر هێشتەوە و دواتر لەگۆڕستانی کەلیمییەکان، بەخاکیان سپاردن. دواتر ئەوانیان فرێدایە ناو چاڵێك لەبۆنی زەبابی. زەینەب کچی عەبدواللە و خوشکی محەممەد و کچی فاتیمە، کەسی بۆ لای عیسا نارد و پەیامیدا: ئێوە ئەوتان کوشت و تۆڵەی خۆتان سەندەوە. باشترە مۆڵەتمان پێبدەن تا بەخاکی بسپێرین؟ عیسا فەرمانی بەو خاتوونەدا تا لەبەقیع بەخاکی بسپێرێت. مەنسور فەرمانیدا ڕێگەی هاوەردەکردنی کەل و پەل و پێویستییەکانیان لەدەریاوە بۆ مەدینە گر. کاتێك مەهدی هاتەسەر کار، فەرمانی کردنەوەی ڕێگاکانیدا.

## ئەو کەسانەی لەگەڵ محەممەد کوژران

لەناو مناڵەکانی هاشم و ئەو کەسانەی هاوڕێیەتی محەممەدیان دەکرد، دتوانین ئاماژە بەناوی ئەم کەسانە بدەین: براکەی موسا کوڕی عەبدواللە و عەلی و حسەین دوو کوڕەکەی زەید کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، کاتێك مەنسور بیستی دوو کوڕەکەی زەید هاوکاری محەممەدیان کردووە، وتی: کاری ئەم دووانە سەرنج ڕاکێشە! دژی من شۆڕشیان کرد لەکاتێدا من بکوژەکەی باوکیانم کوشت، بەهەمان شێوە لەسێدارەمدا کە باوکی ئەوانی لەسێدارەدا بوو، بەهەمان شێوە سووتاندم کەباوکی ئەوانی سوتاندبوو، حەمزە کوڕی عەبدواللە کوڕی محەممەد کوڕی حسەین، عەلی و زەید کوڕەکانی ساڵح کوڕەکانی معاویە کوڕی عەبدواللە کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالب، قاسم کوڕی ئیسحاق کوڕی عەبدواللە کوڕی جەعفەر، مورجی عەلی کوڕی جەعفەر کوڕی ئیسحاق کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی جەعفەر کەباوکی هاوڕێیەتی مەنسوری دەکرد. لەکەسانیتر جگە لەهاشمییەکان: محەممەد کوڕی عەبدواللە کوڕی عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عەباس، محەممەد کوڕی عەجەلان، عەبدواللە کوڕی عومەر کوڕی حەفس کوڕی عاسم کەگرفتار بوو و ئەویان بردە لای مەنسور. مەنسور پرسیاری لێکرد: تۆ بوویت کەدژی من ئاڵای شۆڕشت بەرز کردەوە؟ وتی: یا دەبووا لەگەڵ تۆ شەڕ بکەم یا بەوەی پێغەمبەر هێنابووی، ناباوەڕ دەبووم، ئەبووبەکر کوڕی عەبدواللە کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی سەبرە، عەبد واحید کوڕی ئەبی عەون موالی ئەزد، عەبدواللە کوڕی جەعفەر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی میسوەر کوڕی مەخریمە، عەبدولعەزیز کوڕی محەممەدی دەراوەردی، عەبدحەمید کوڕی جەعفەر، عەبدواللە کوڕی عەتا کوڕی یەعقووب موالی منداڵەکانی سیباع، ئیسحق، ڕەبیعە، جەعفەر، عەبدواللە، عەتا، یەعقوب، عوسمان،

عەبدولعەزیز هەموویان کوڕی عەبدواللە کوڕی عەتا بوون، عیسا کوڕی خوزمیر، عوسمان کوڕی خوزمیر، عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی خالید کوڕی زوبەیر کەبەدوای کوژرانی محەممەد هەلآت و رووی کردە بەسرە. بەلآم ئەویان گرت و بردیان بۆ لای مەنسور و وتی: ها، ئەی عوسمان، تۆ هاورێ لەگەڵ محەممەد دژی سوپاکەی من شەڕت کرد؟ من و تۆ لەمەککە پەیمانمان بەست، من ڕێزم لەپەیمانەکەی خۆم گرت بەلآم تۆ نا! ئەی زادەی ژنی بۆگەن. وتی: ئەمە تایبەمەندی ئەو کەسەیە کەلەکەنیزەکان لەدایك بووە و کەنیزەکان پەروەردەیان کردووە (تۆیت). فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد، محەممەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی عوبەیداللە کوڕی عەبدواللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب کەبەدیلی گیرا و مەنسور ئازادی کرد، عەبدولعەزیز کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدواللە کوڕی موتیع، عەلی کوڕی عەبد موتەلیب کوڕی عەبدواللە کوڕی جونتۆب، ئیبراهیم کوڕی جەعفەر کوڕی موسعەب کوڕی زوبەیر، هوشام عومارە کوڕی وەلید کوڕی عودەی کوڕی خیار، عەبدواللە کوڕی یەزید کوڕی هورموز و ..... لەگەڵ ئەو کەسانەی ئاماژەمان پێدان.

## تایبەتمەندییەکانی محەممەد و گێڕانەوەکان سەبارەت بەمەرگی ئەو

محەممەد، ئەسمەر و لەئەسمەریدا، ڕەش بەرچاو دەکەوت بەشێوەیەك مەنسوڕ، بەپیاوە ڕەشەکە، ناوی دەبرد. پیاوێك بوو قەڵەو و گۆشتن و بالآبەرز. بوێر و نەترس. نوێژی زۆری دەخوێند و زۆربەی رۆژەکان بەرۆژوو بوو. جارێك ڕۆشتە سەرتەختی وتاردان و وتارێکی پێشکەش کرد. کەمێك بەڵغەم لەقوڕگیدا کۆبوویەوە. کۆکی و بەڵغەمەکەی نەما. گەڕایەوە بۆ ماڵ. سەیری دەورەبەری خۆی دەکرد تا بەڵغەمەکەی ڕۆبکات. هیچ شوێنێکی دەستنەکەوت. سەری بۆ تاقی مزگەوتەکە بەرز کردەوە و بەشێوەیەك بەڵغەمەکەی هەڵدا کە بەتاقی سەقفەکەوە، چەسپا.

سەبارەت بەو لەجەعفەری سادق پرسیاریان کرد کە: چارەنوسی ئەو چییە و بەکوێ کۆتایی دێت. وتی: ئاژاوەیەك دەردەکەوێت تیایدا و محەممەد و براکەی دەکوژرێن، دایکی لەعێراق دەبێت و سمی ئەسپەکانیان لەناو ئاو.

کاتێك محەممەد کوژرا، عیسا هەموو سامانەکانی محەممەد و سامانەکانی جەعفەری سادقی گرت. جەعفەر ڕۆشتە لای مەنسور و چاوی پێیکەوت و وتی: زەوی و دەشەش دانگی من لەباوکی زیاد وەربگرەوە و بۆمی بگەڕێنەوە. مەنسور وتی: بەمشێوەیە قسە لەگەڵ من

دەکەیت؟ سوێند بەخوا بێ چەند و چوون دەتکوژم. جەعفەری سادق وتی: لەتوڕە بووندا پەلە مەکە، تەمەنی من شەست و سێ ساڵ و باوکم و باوەگەورێم (عەلی کوڕی ئەبی تالب) لەم شارەدا مردوون. بەڵێن دەدەم تا ئەو کاتەی زیندووم بەهیچ شێوەیەك نەبمە هۆی ڕەنجاندنی تۆ و زیان لەو کەسەیش نەدەم دوای تۆ دێتە سەرکار. مەنسور بەزەیی پیایدا هاتەوە بەلاّم سامانەکەی بۆ نەگەڕاندەوە. دوای ئەو، مەهدی، سامانەکانی ئەو بنەماڵەی بۆ گەڕاندنەوە.

جارێکیان محەممەد بەعەبدوالله کوڕی عامری ئەسلەمی وت: هەورێك دێت و سێبەرمان بۆ دروست دەکات. ئەگەر بباریێت، سەرکەوتن بەدەست دێنین و ئەگەر بڕوات و باران بەسەر ئەواندا ببارێنێت، خوێنی من لای بەردەکان، لەسەر زەوی بەرزاوی دەبینیت. دەڵێت: سوێند بەخوا زۆری نەخایاند هەورێك هات و سێبەری بۆ دروست کردین بەلاّم باران نەباری و لەئێمە تێپەڕی کرد و بارانی بەسەر عیسا و سوپاکەیدا باراند.

کوژرانی ئەو لەرۆژی دووشەممە چواردەی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٥/ ٦ دێسامبەری ٧٦٢ زایینی، ڕوویدا.

ئەویان بە سۆشیانس و گیان پاك، ناودەبرد. لەناو ئەو هۆنراوانەی بۆ مەرگی ئەو هۆنراونەتەوە، یەکیان هۆنراوەکەی عەبدوالله کوڕی موسعەب کوڕی سابتە:

| | |
|---|---|
| یا صاحبی دعا الملامة و اعلما | ان لست فی هذا بالوم منکما |
| وقفا بقبر للنبی فسلما | لا باس ان تقفا به و تسلما |
| قبر تسلم خیر اهل زمانه | حسبا و طیب سجیة و تکرما |
| رجل نفی بالعدل جور بلادنا | و عفا عظیمات الامور و انعما |
| لم یجتنب قسد السبیل و لم یجر | عنه و لم یفتح بفاحشة فما |
| لو اعظلم الحدثان شیئا قبله | بعد النبی لکنت المعظما |
| او کان امتع بالسلامة قبله | احدا لکان قصاره ان یسلما |
| ضحوا بابراهیم خیر ضحیة | فتصرمت ایامه فتصرما |
| بطلا یخوض بنفسه عمراته | لا طائشا رعشا و لا مستسلما |
| حتی مضت فیه السیوف و ربما | کانت حتوفهم السیوف و ربما |
| اضحی بنو حسن ابیح حریمهم | فینا و اصبح نهبهم متقسما |
| و نساوهم فی دورهن نوائح | سجع الحمام اذالحمام ترنما |

| | |
|---|---|
| يتوصلون بقتله و يرونه | شرفا لهم عند الامام و مغنما |
| و اللة لو شهد النبي محمد | صلى الاله على النبي و سلما |
| اشراع امته الاسنة لابنه | حتى تقطر من ظباتهم دما |
| حقا لا يقن انهم قد ضيعوا | تلك القرابة و استحلوا المحرما |

یانی: هاوڕێیانی مـن سەرکۆنە مەکەن و بزانن لەم کارەدا لەئێوە زیاتر شیاوی سەرکۆنە کردن نیم. لەسەر ئارامگای پێغەمبەر(د.خ) بووەستن و سلاَو و دروودی بۆ بنێرن. کەواتە، ڕەخنە مەگرن ئەگەر لای گیانبازێك لەرێگەی ڕزگاری خەڵکان، کەمێك بمێننەوە و سلاَو بۆ خەوتووی ناو گۆڕەکە، بنێرن. ئارامگایەکە کە لەروانگەی نەژاد و پاك سرشتی و ڕێزداری، باشترین کەسانی ڕۆژگاری پشت سەرناوە. پیاوێکە لەرێگەی شەڕ بۆ دادپەروەری، ستەمی لەشارەکانی ئێمە دوور کردەوە و کارە گەورەکانی بەسووك لەقەڵەمدا و چاکەکاری لەئەندازە گوزەراند. لەرێگەی ڕاست، گومڕا نەبوو و هیچ کات بۆ وتاری ناشیرین. زمانی نەکردووە. ئەگەر پێشهاتە گرانەکانیان، پێش ئەو، دوای پێغەمبەر(د.خ)، بەکارێکی گەورە و مەترسیدار لەقەڵەم دەدا، ئەو بوو و تۆ بوویت ئەی ڕێزدار کە بەرێزدار هەژمار دەکرایت. یا ئەگەر کەسێك پێش ئەو لەتەندروستییەکی هەمیشەییدا دەمایەوە، هەرە گرنگەکەی ئەوە بوو کەرۆژگاری نەمری بەسەر دەبرد. بۆ ئیبراهیم باشترین قوربانییان هێنا و لەبەر ئەمە، ڕۆژگاری ئەو تێپەڕی و چاوی لەم جیهانە بەست. پاڵەوانێك کە لەناو گێژاوەکانی مەرگ، بە بەهێزی مەلە دەکات، نەسەرگەردان دەبێت، نەدەلەرزێت، نەمەرگ، گرنگی دەبێت، نەخۆی تەسلیم بەدوژمن دەکات، تا ئەوەی شمشێرەکان جەستەیان شەقار کرد و ڕمەکان، زرێکەیان لەت لەت کرد. شەرکەرانی گۆڕەپان بینیان کەپاڵەوانەکان بەوشێوەیە گیان دەبەخشن. منالەکانی حەسەن لەکاتی گیان بەخشین بۆ ڕزگاری خەڵکان، تا ئەو پێگەیە بەرز بوونەوە کەرێزی ئەوانیان نەگرت و سامانی ئەوان، بەدەستی تالاَنچییەکان، تالاَن کرا. خاتوونەکانیان لەناو ،ماڵەکاندا شین و ڕۆڕۆیان دەستپێکرد و ڕوخساری وەك گوڵی خۆیان بەفرمێسك تەڕ کرد و لەم کاتەدا، هاوشێوەی ئەو کۆترانە بوون کەدڵیان بەخۆشەویستی دڵدار بەست. خراپەکاران بەکوشتنی ئەوان، خۆیان لەپێشەوا نزیك دەکردەوە و لای ڕێبەر، کوشتنی ئەویان بەهۆکاری شانازی کردن دەزانی و ناوی دەسهاتی خۆراییان لێدەنا. سوێند بەخواوەندی خواوەند ئەگەر پێغەمبەر زیندوو دەبوو و دەیبینی کەخەڵکەکەی ڕمە لەسینەی کوڕەکەی دەچەقێنن، بەشێوەیەك لەشوێنی برینەکانی خوێن فیچقە دەکات، بێ

هیچ گومانێك باوەڕی دەكرد كەئەوان پەیوەندی خزمایەتیان پچڕاندوە و نارەوای ئەویان، حەلاڵ كردووە و بۆ و بۆ كوشتنی ئەو، ئەسپەكانیان خۆیان زین كردووە.

كاتێك محەممەد كوژرا، عیسا چەند ڕۆژێك لەمەدینە مایەوە و بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩ ڕەمەزان، ١١ دێسامبەری ٧٦٢ زایینی، ئەو شارەی بەجێهێشت تا حەجی عەمرە بەجێ بێنێت. كەسیر كوڕی حوسەینی وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان كرد كە بۆ ماوەی یەك مانگ لەو پۆستەدا مایەوە و دواتر مەنسور، عەبدوالله كوڕی ڕەبیعی حارسی وەك فەرمانداری ڕەوانە كرد.

## شۆڕشی ڕەشەكان لەمەدینە

لەم ساڵەدا ڕەش پێستەكانی مەدینە لەبەرابەر فەرماندارەكە عەبدوالله كوڕی ڕەبیعی حارسی ئالای شۆڕشیان بەرز كردەو. عەبدوالله، لەشارەكە ڕۆشتەدەر و هەلات.

هۆكارەكەی ئەوە بوو كەمەنسوور، عەبدوالله كوڕی ڕەبیعی حارسی وەك فەرمانداری مدینە دەستنیشان كرد كەپێنج ڕۆژ بۆ كۆتایی شەوال/ ١٦ ژانویەی ٧٦٣ زایینی، ڕۆشتە ناو شارەكە. سوپاكەی ئەو، سەبارەت بەبەهای هەندێ شت كە لەشارەكەدا مامڵەیان دەكرد، لەگەڵ بازرگانانی ئەو شارە، شەڕ و ئاژاوەیان نایەوە. بازرگانەكان سكاڵایان بۆ لای كوڕی ڕەبیع بەرز كردەوە. ڕەبیع ئەوانی لەخۆی دوور كردەوە و ئیهانەی كردن. تەماحكاری سەربازەكان بۆ كاڵای بازرگانەكان زیادی كرد و ئەوان هێرشیان كردە سەر یەكێك لەبازرگانەكان و كاڵاكانی ئەویان ڕفاند. بازرگانەكە، داوای هاوكاری لەخەڵك كرد بۆ ئەوەی سامانەكەی بەدەست بێنێتەوە. خەڵكانی مەدینە دووبارە سكاڵایان بۆ لای كوڕی ڕەبیع بەرز كردەوە بەڵام كوڕی ڕەبیع، گرنگی بەسكاڵاكەی ئەوان نەدا. دواتر، سەربازێك هات و لەگۆشت فرۆشی لەرۆژی هەینی، گۆشتی كڕی بەڵام بەهاكەی نەدا و پشتی بەشمشێرەكەی بەست. گۆشت فرۆش كێردەكەی لەورگی چەقاند و ئەوی كوشت. گۆشت فرۆشەكان و ڕەشەكان كۆبوونەوە و هێرشیان كردە سەر سەبازەكان و بەگورز و دار دەستیان بەكوشتاری ئەوان كرد و دواتر بەمەبەستی خوێندنی نوێژی هەینی، ملی ڕێگەیان گرتەبەر. ئەوان شەپووریان ژەنی و ڕەشەكان لەخوارەوە و سەرەوەی شارەكە، دەنگی ئەوانیان بیست و ڕوویان كردە گۆڕەپانی شەڕ و ژمارەیان فراوان بوو. سەركردەكانیان سێ كەس بوون بەناوەكانی وەسیق و یەعقول و زەمعە. ئەوان، تا ئێوارێ سەرقاڵی كوشتاری سەربازەكان بوون.

بۆ بەیانی، مەبەستی کوشتنی کوڕی ڕەبیعیان کرد. کوڕی ڕەبیع هەڵات و دوو شەو و ڕۆژ، بەراکردن لەشارەکە دوور کەوتەوە تا ئەوەی گەیشتە دارستانێکی خورما و لەوێ، وچانی گرت. ئەو خەڵکە، بەشێك لەخۆراکەمەنییەکانی تایبەت بەمەنسووریان لەگەڵ ڕۆن و خورمای وشك بەتاڵانی برد. هەمانی ئاردیان بەدوو درەم و مەشکەیەك ڕۆنیان بەچوار درەم دەفرۆشت.

سلێمان کوڕی مەلیح لەهەمان ڕۆژ ڕۆشتە لای مەنسور و لەم کارەی خەڵکانی مەدینە ئاگاداری کردەوە.

لەم کاتەدا ئەبووبەکرە کوڕی ئەبی سەبرە لەزینداندا بوو. ئەویان لەگەڵ محەممەد کوڕی عەبدوالله ئەسیر و ئەشکەنجە و زیندانی و بەزنجیر بەستبوویانەوە. کاتێك ڕەشەکان، دەستیان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە درێژ کرد، ئەو، زنجیر لەدەست و پێ، لەزیندان هاتەدەر و ڕۆشتە مزگەوت و کەسی بەدوای محەممەد کوڕی عیمران و محەممەد کوڕی عەبد عەزر و کەسانی دیکە نارد و ئەوانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا بەوردی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم ئاژاوەیە بکەن چوونکە ئەگەر دوای ئاژاوەی پێشوو، شتێکی دیکە لای سەروەری باوەڕداران دروست ببێت، دەبێتە هۆکاری لەناوچوونی شارەکەی ئێوە و هەموان دەبینە کۆیلە. بڕۆنە لای ئەوان و سەبارەت بەگەڕانەوە، گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن چوونکە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئێوەن لەبەر ئەوەی تەنیا تووڕەیی بوو ئەم ئاژاوەی لێکەوتەوە.

ئەوان، ڕۆشتنە لای کۆیلەکان و قسەیان لەگەڵ کردن و وەڵامیان بیستەوە کە: دەسخۆش بۆ گەورە و سەروەرمان. سوێند بەخوا ئێمە تەنیا لەبەر سزادانی و ئازاری ئێوە، شۆڕشمان دەستپێکرد. هەنووکەی کاروباری ئێمە لەدەستی ئێوەدایە. ئەوان، کۆیلەکانیان بردە ناو مزگەوت و کوڕی ئەبی سەبرە قسەی بۆ کردن و پێشنیاری فەرمانبەری سەروەری باوەڕدارانی پێدان کەگوێیان لەوتەکانی گرت بەڵام ئەو ڕۆژە کەس نوێژی هەینی نەخوێند. کاتێك نوێژی خەوتنان، بانگبێژ، بانگیدا بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. ئەسبەغ کوڕی سوفیان کوڕی عاسم کوڕی عەبدعەزیز کوڕی مەروان، هەنگاوی بردە پێش. کاتێك بۆ نوێژ خوێندن خۆی ئامادە کرد و ڕیزەکان پەیوەستی یەك بوون، ئاوڕی دایەوە و بەدەنگی بەرز هاواری کرد: من فلان کوڕی فلانم. لەسەر بنەمای گوێڕایەڵی سەروەری باوەڕداران، پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکەم. دوو سێ جار وتەکەی دووبارە کردەوە. دواتر پێشنوێژی بۆ

ئەوان کرد. بۆ بەیانی کوڕی ئەبی سەبرە پێی وتن: دوێنێکە کارێکتان کرد کەلێی ئاگادارن. خواردەمەنی سەروەری باوەڕدارانتان فڕاند و دەستتان بۆ سامانەکەی ئەو درێژ کرد. نابێت هیچ شتێك لەدەستی کەسدا بمێنێتەوە مەگەر ئەوەی بیگەڕێنێتەوە. هەموو شتەکانیان گەڕاندەوە. کوڕی رەبیع دارستانی خورماکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ مەدینە و دەستی وەسیق و یەعقول وکەسانی دیکەی بڕی.

## بناغەدانانی شاری بەغداد

لەم ساڵەدا مەنسور، بناغەی شاری بەغدادی داڕشت.

چۆنیەتیەکەی ئەوەی کەئەو، بناغەی شاری هاشمییەی لەنزیك کوفە دارشتبوو. کاتێك راوەندییەکان لەوێ، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە، لەخەڵکەکەی ڕەنجا و دراوسێیەتی خەڵکانی کوفە بەناپەسەند و ناخۆش لەقەڵەمدا چوونکە لەگیانی خۆی دڵنیا نەبوو لەبەر ئەوەی دڵی هەموو سەربازەکانی ئەویان گۆڕیبوو. بەتەنیا هاتەدەر و بەدوای شوێنێکی سەرسەوز و ئاوەداندا گەڕا تا خۆی وسوپاکەی لەوێ نیشتەجێ ببن. بەرەو جەرجەرایا سەرەوخوار بوویەوە. دواتر بەرەو موسڵ و کوێستانەکان ملی رێگەی گرتەبەر تا ماڵێك بۆ خۆی دروست بکات. یەکێك لەشەرکەرەکانی لەتاو ئازاری چاو، لەمەداین مایەوە. پزیشکە تیمارکەرەکەی پرسیاری رۆشتنی مەنسوری لێکرد. ئاگاداری کردەوە. پزیشك پێی وت: ئێمە لەنووسراوەکانی خۆماندا بینیوومانە کەپیاوێك بەو ناونیشانە (سواڵکەر) شارێك بەناوی زەورا لەنێوان دیجلە و فوراتدا دروست دەکات. کاتێك بناغەی شارەکەی دەستپێبکات، تێکشکان لەحیجازەوە بەسەر ئەودا دەبارێت و رێگەی دروست کردنی شارەکەی لێدەگرێت. ئەو، چارەسەری ئەو گرفتە دەکات و دووبارە سەرقاڵی کارەکەی دەبێتەوە. دواتر گرفتاری و کێشەیەکی گەورەتر لەبەسرە روودەدات بەڵام زۆری پێناچێت چارەسەری ئەو گرفت و کێشەیش دەکات و سەرلەنوێ کاری دروست کردنی شارەکە دەستپێدەکاتەوە و کۆتایی پێدێنێت و تەمەنی درێژ و پاشایەتی لەناو بنەماڵەکەیدا دەمێنێتەوە.

ئەو سەربازە، بۆ ناو لەشکرگەکەی مەنسور گەڕایەوە. مەنسور لەدەوروبەرەکانی کوێستان بوو. سوێند بەخوا من لەمناڵییەوە بەرەزیل ناوبراوم بەڵام ئەم تایبەتمەندییە چیتر لەمندا بوونی نییە. بەرێکەوت تا لەخانەقایەك لەبەرابەر کۆشکی داهاتووی ئەو (جاویدان) دابەزی وئەم کەسانەی بانگ کرد: خاوەنی خانەقاکە، دیندارەکان، ئاشەوانەکەی

ئەو ناوچە، فەرمانداری بەغداد، خاوەنی موخەرەم، خاوەنی بێستا و گەنجە گرانباییە کۆنەکان. سەبارەت بەشوێن و جێگەی ژیانی ئەوان یەك یەك پرسیاری لێکرد کەگەرمی و ساردی و باران و زۆلکاو و مارو مێروو و دەعباکانی چەندە و چۆنە. هەموویان، لەوەی دەیانزانی، ئاگاداریان کردەوە. ئەوان، فەرمانداری بەغدادیان هەڵبژارد. ئەویان بانگ کرد تا راوێژی لەگەڵ بکات.

پیاو وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سەبارەت بەم شتانە پرسیار لەمن دەکەیت بۆ ئەوەی بزانیت کامیان هەڵبژێریت و کامیان پشتگوێ بخەیت. بۆچوونم ئەوەیە لەچوار گەڕەك دابەزیت. لەرۆژئاوا دوو گەڕەك بەناوەکانی قەترەبوول و بادوریا و لەرۆژهەلأت دوو گەڕەك بەناوەکانی رووباری بۆق و کلوازی. شوێنی مانەوەی تۆ لەنێوان دارخورماکاندا بێت و لەنزیك ئاوەکە. ئەگەر گەڕەکێك گیرۆدە وشکەساڵی بیت و دروست کردنەکەی دواکەوێت، لەگەڕەکەکەی دیکە بیناکان لەبەردەستی تۆدایە. تۆ، ئەی سەروەری باوەڕداران لەفورات دەبیت کەخواردەمەنی و کەل و پەلی پێویست لەشام و رۆژئاوا و رەقە، لەگەڵ کاروانییەکانی میسر، دەگەنە لای تۆ و لەچین و هیند، بەسرە، واست، دیاربەکر، موسڵ، رۆم و لەرێگەی دیجلەوە نیازەکانی تۆ دابین دەکەن. هەروەها لەئەرمەنستان و شوێنەکانی پەیوەستی تا زاب، خواردەمەنی بۆ تۆ کۆدەبێتەوە. تۆ لەناو رووبارەکاندایت بەشێوەیەك دوژمنان تەنیا بەهەڵبەستنی پرد، دتوانن دەستیان بەتۆ بگات. کاتێك پردەکە بروخێنیت، چیتر دەستیان بەتۆ ناگات. بزانە کەفورات و سەرات و دیجلە، سەنگەر و خەندەکەکانی ئەم شارەن و تۆ لەنێوان بەسرە، کوفە، واست، موسڵ و سواد رۆژگار بەسەر دەبەیت و لەوشکی و کێو و دەریاوە نزیك دەبیت. لەم کاتەدا بوو مەنسور بڕیاری مانەوە لەو شوێنەی دەرکرد.

دەستەیەك دەڵێن: کاتێك مەنسور مەبەستی دروست کردنی شاری بەغدادی کرد، خواپەرستێك لەمەسیحییەکانی بینی و بانگی کرد. پیاوەکە وەڵامی دایەوە. وتی: ئایا لەنووسراوەکانی خۆتان سەبارەت بەدروست کردنی شارێك لەم ناوچەیە، هیچت بینیوە؟ وتی: بەڵێ، پیاوێکی ڕەزیل دروستی دەکات. مەنسور وتی: بەڵێ، لەمناڵی بەو شێوەیە بانگیان دەکردم. خواپەرست وتی: تۆ خاوەنی ئەو شارەیت.

مەنسور لەساڵی ١٤٥ کۆچی/ ٧٦٢ زایینی، دروست کردنی شارەکەی دەستپێکرد و نامەی بۆ شام و کوێستان و کوفە و واست و بەسرە نووسی تا وەستا و کرێکارەکان ڕەوانە بکەن. هەروەها دەستەیەك لەدیندارەکان و دادوەران و زاناکانی هەڵبژارد و فەرمانی پێدان

خەڵکانێکی بەهێز و ئەندازیار لەو کەسانەی حەجاج کوڕی ئەرتات و باوکی حەنیفە بەمەبەستی ئەم کارە کۆیان کردبوویەوە، کۆبکەنەوە. فەرمانیدا نەخشەی شارەکە بکێشن و خەندەکی ماڵەکان و خشتی کاڵ دروست و سووری بکەنەوە و کاروبارەکان رێکبخەن. یەکەم کاری ئەوە بوو خۆڵەمیشی بەسەر هێڵەکانی نەخشەکەدا کێشا و دواتر بەناو بازار و شەقامەکان و رێگەکانی ناوشار و گەرماوەکان و هەموو ئەو شوێنانەی بەخۆڵەمێش دەستنیشان کرابوو، گەڕا و پیاسەی کرد. دواتر فەرمانیدا پەمۆ بکەنە سەر خۆڵەمێشەکە و ئاگری تێبەربدەن. ئاگر بڵێسەی سەند و مەنسور هەموو شتێکی بەئاشکرا و روونی بینی و پەسەندی کرد. فەرمانیدا خەندەکەکان بەپێی نەخشەکە کێشراوەکە هەڵبکەنن. چوار سەرکرێکاری بۆ دانا، هەر سەر کرێکارێك بۆ گەڕەکێك، فەرمانی بەباوکی حەنیفەدا ژمارەی خشتی کاڵ و سوورەوە بوو رابگرێت. پێشتر ئەم فەرمانەی بەباوکی حەنیفەدا بوو بەڵام پشتگوێی خست. باوکی حەنیفە بەسەرژمێری خشت و هەموو ئەو کەرەستانەی بۆ دروست کردنی شارەکە تەرخان دەکران، رازی بوو. یەکەم کەس بوو ئەم کارەی کرد.

مەنسور، پانای بناغەی دیوارەکەی بەپەنجا گەز و بەرزییەکەی بەبیست گەز، دیاریکرد. بۆ بیناکان لەدار و قامیش کەڵکی وەرگرت و خۆی، یەکەم خشتی دانا و وتی: بەناوی پەروەردگاری و سپاسی پەروەردگار. زەوی هی خوایە، بەهەرکەسی بووێت، دەبەخشێت و ئەنجامی کار، بۆ خواپەرستانە. بەپیرۆزی ناوی خواوەند، دروستکردنی شارەکە دەستپێبکەن.

کاتێك بەرزی دیوارەکە بەئەندازەی بەرزی باڵای پیاوێك بەرز بوویەوە، هەواڵی رۆژی کۆتایی محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە گەیشت. لەم کاتەدا، کاری دروست کردنی شارەکەی پەکی کەوت و مەنسور لەکوفە مایەوە تا ئەو کاتەی لەشەڕی محەممەد و ئیبراهیمی برای رزگاری بوو. دواتر بۆ بەغداد گەڕایەوە و کۆتایی بەکارەکەی هێنا و لەزەوییە بەربڵاوەکانی ئەو شارەی بەهاوڕێ و کەسە نزیکەکانی بەخشی.

مەنسور، هەموو پێداویستییەکانی دروست کردنی شارەکەی لەدار و  ئیرگە و شتەکانی دیکە، کۆکردەوە. هەرکاتێك بەمەبەستی ئەنجامدانی کارێك دەگەڕایەوە بۆ کوفە، کۆیلەکەی خۆی، ئەسلەمی وەك جێگری خۆی دادەنا تا چەوتییەکان راست و کارەکان بەباشترین شێوە رابەرێنێت. هەواڵی پێگەیشت کەئیبراهیم، سوپاکەی مەنسوری شکستداوە، لەبەر ئەمە، هەمووی ئەوەی مەنسور بەدەستی ئەوی سپاردبوو، خستیە ناو ئاگر. مەنسوریان لەم کارەی ئەسلەم ئاگادار کردەوە کەنامەی بۆ نووسی و سەرکۆنەی کرد. ئەسلەم وەڵامیدایە کە: ترسام

ئیبراهیم سەرکەوتن بەدەست بێنیت و دەستیان بەسەردا بگرێت. مەنسور، هیچی پێنەوت.

بەخواستی خواوەند چۆنیەتی دروستی کردنی شارەکە، لەساڵی ١٤٦/ ٧٦٣ زایینی باس دەکەین.

## دەرکەوتنی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن، برای محەممەد

لەم ساڵەدا، ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، برای محەممەد، دەرکەوت. پێش ئەوەی شۆڕش دەستپێبکات، بەدوایدا دەگەڕان. کەنیزەکەی ئەو دەڵێت بۆ ماوەی پێنج ساڵ نەیتوانی لەهیچ سەرزەمینێك ئارام بگرێت: ڕۆژێك لەپارس، ڕۆژێك لەکرمان، ڕۆژێك لەکوێستان، سەردەمێك لەحیجاز، کاتێك لەیەمەن و ماوەیەك لەشام. دواتر هاتە موسڵ و مەنسور بەدوای ئەو، گەشتە شارەکە. ئیبراهیم وتی: بەڕادەیەك لەهەڵاتن و شوێنکەوتنی ئەوان بێزار بووم کەلەموسڵ لەسەر سفرەکەی مەنسور دانیشتم. دواتر هاتمەدەر و بینیم چیتر شوێنم ناکەون.

لەم کاتەدا، دەستەیەك لەشەڕکەران، شوێنکەوتەی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) بوون. نامەیان بۆ نووسی و داوایان لێکرد بڕواتە لای ئەوان تا دژی مەنسور ئاڵای شۆڕش بەرز بکەنەوە. ئەو، ڕۆشتە لەشکرگەکەی ئەبووجەعفەر. مەنسور لەبەغداد بوو و نەخشەی شارەکەی دەکێشا. ئاوێنەیەکی بوو کەکاتێك سەیری دەکرد دۆستی لەدوژمن جیا دەکردەوە. جارێکیان سەیری ئاوێنەکەی کرد و وتی: ئەی موسەییب، ئیبراهیمم لەناو سوپاکەی خۆمدا بینی. لەسەراسەری زەوی هیچ کەس بەئەندازەی ئەو دوژمنی من نییە. بزانە کێیە.

مەنسور فەرمانی دروست کردنی پردی کۆنەی سەراتی دا. ئیبراهیم لەگەڵ خەڵکان هاتەدەر و سەیری دەکرد. لێرەدا، مەنسور ئەوی بینی. ئیبراهیم خۆی لەناو خەڵکدا شاردەوە. پەنای بۆ ڤامییا برد. ئەو، ئیبراهیمی لەسەرەوەی ماڵەکەی خۆی شاردەوە. مەنسور بەهەموو هێزییەوە بەدواییدا دەگەڕا و لەهەموو شوێنێکدا پیاوەکانی خۆی بۆ دۆزینەوەی ئەو راسپارد. سوفیان کوڕی حەییانی قومی پێی وت: دەبینی چ بەڵایەکمان بەسەردا هاتووە، بەناچاری دەبێت ڕووبەڕووی بەڵاکان ببینەوە. وتی: تۆ هەموو دەسەڵاتێکت پێبەخشراوە. سوفیان ڕۆشتە لای ڕەبیع و داوای مۆڵەتی کرد تا سەردانی مەنسور بکات. ئەو، سوفیانی بردە لای مەنسور. کاتێك ئەوی بینی، زمانی بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو کردەوە. سوفیان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، شیاوم بۆ جوێن ونیهانە کردنی تۆ، تەنیا بۆ داوای بەخشین

هاتوومەتە بارەگای تۆ و ئەوەی بخوازیت، لەگەڵ خۆم هێناومە. دەڕۆم و ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله لەگەڵ خۆم دەهێنم. ئەوانم تاقیکردۆتەوە و هیچ چاکەیەکم لەوان نەبینیوە. مۆڵەتێکم بۆ بنووسە و کۆیلەیەك لەگەڵ مندا بنێرە و مۆڵەتیش بۆ ئەو بنووسە و لەگەڵ سوپایەك، ڕەوانەمان بکە. مەنسور مۆڵەتی بۆ نووسی و سوپایەکی خستە بەردەست، وتی: ئەوە هەزار دینار، لەکاتی پێویست کەڵکی لێوەربگرە. وتی: پێویستم بەهەزار دینار نییە. سێسەد دیناری هەڵگرت و لەگەڵ سوپاکەی، ملی ڕێگەی گرتەبەر. ڕۆشتە ناو ماڵەکەی و بینی ئیبراهیم جل و بەرگی پۆشیوە و ڕووپۆشێکی هاوشێوەی کۆیلەکانی خستۆتە سەرشان. بەسەر ئەودا قیژاندی وەك بڵێی ئیبراهیم کۆیلەی ئەوە. ئیبراهیم لەشوێنەکەی خۆی هەستا و سوفیان فەرمانی بازدداشت کردنی ئەوی دەرکرد و لەگەڵ پەیکەکە، بەرێکەوت.

دەستەیەك دەڵێن: سواری چوارپێکەی نێردراوەکە نەبوو.

بەرێکەوت تا گەیشتە مەداین. خاوەنی پردەکە، ڕێگەی نەدا لەپردەکە بپەڕێتەوە. مۆڵەتەکەی نیشاندا و کاتێك پەڕییەوە، پاسەوانی پردەکە پێی وت: ئەمە کۆیلە نییە، ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله‌یە، بڕۆ هیوادارم تەندروست و سلامەت بیت. ئەو دووانەی ئازاد کرد. هەردووکیان سوار کەشتی بوون و بەرەو بەسرە بەرێکەوتن و ڕۆشتنە ناو شارەکە. سوفیان بەمشێوەیە بلاوەی بەسوپاکەی خۆی کرد کەدوان دوان لەبەردەم دەرگای ماڵێکدا دایدەنان و پێی دەوتن لەشوێنەکەی خۆتان نەجووڵێن تا دەگەڕێمەوە. دواتر لەدەرگایەکی دیکە دەرۆشتەدەر. بەمشێوەیە سوپاکەی لەدەوری خۆی بلاو کردەوە و بەتەنیا مایەوە.

هەواڵی ئەم کارە بەسوفیان کوڕی معاویە، فەرمانداری بەسرە گەیشت. کەسی بەدوای ئەواندا ڕەوانە کرد و هەموویانی کۆکردەوە. بەدوای قومیدا گەڕا بەلام نەیدۆزییەوە. ئیبراهیم ڕۆشتە ئەهواز و لای حەسەن کوڕی خەبیب خۆی داشارد. محەممەد کوڕی حوسەین، شوێنی کەوتبوو. ڕۆژێك وتی: سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ نووسیوم و ئاگاداری کردومەتەوە کەئەستێرە ناسەکان ئەویان لەئەهواز لەنێوان دوو رووباردا بینیوە. من لەدوورگەکەدا بەدوایدا گەڕام بەلام لەوێ نەبوو. بڕیارمداوە بەیانی لەناو شارەکەدا بەدوایدا بگەڕێم چوونکە ئەگەری هەیە مەبەستی سەروەری باوەڕداران لەنێوان دوو رووبار، مەسورقان و دوجەیل بێت. حەسەن کوڕی خەبیب ڕۆشتە لای ئیبراهیم وئاگاداری کردەوە. ئەوی لەشارەکە بردەدەر و بەمشێوەیە ئەو ڕۆژە محەممەد نەیتوانی بیدۆزێتەوە.

کاتێك ڕۆژ کۆتایی هات، حەسەن ڕۆشتە لای ئیبراهیم و ئەوی گەڕاندەوە بۆ ناو شارەکە.

هەردووکیان لەکاتی نوێژی خەوتن سواری کەرێك بوون. پێشەنگەکانی سوپای کوڕی حوسەین ئەوانیان بینی. ئیبراهیم دابەزی و وای نیشاندا دەیەوێت گمیز بکات. کوڕی حوسەین، لەحەسەنی پرسی: لەکوێوەوە . دێیت. حەسەن وتی: لای خزمەکانم بووم. کوڕی حوسەین ڕێگەی ڕۆشتنی پێدا. حەسەن ڕۆشتە لای ئیبراهیم و سواری کردەوە و گەڕانەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. ئیبراهیم وتی: سوێند بەخوا لەجیاتی گمیز، خوێن هاتەدەر. دەڵێت: ڕۆشتمە شوێنەکە و بینیم لەجیاتی گمیز، خوێنی کردووە.

ئیبراهیم هاتە ناو بەسرە. دەڵێن: لەساڵی ١٤٥/ ٧٦٢ زایینی، دوای دەرکەوتنی براکەی لەمەدینە، ڕۆشتە ئەو شارە. هەروەها دەڵێن: لەساڵی ١٤٣/ ٧٦٠ زایینی ڕوویدا. ئەوەی ئەوی بردە ناو شارەکە و خەرجییەکانی ئەوی لەئەستۆ گرت و ڕێگەی نیشاندەدا، بەوتەی دەستەیەك لەمێژوونووسان، یەحیا کوڕی زیاد کوڕی حەییانی نەبتی بوو کەلەناو منداڵەکانی لەیس، نیشتەجێی کرد. دەستەیەك دەڵێن: لەماڵی باوکی فەروە دابەزی. ئەم کەسانە یەکەمین کەسان بوون پەیمانی فەرمانبەریان لەگەڵ بەست.: نومەیلە کوڕی مورە عەبشەمی، عەفوالله کوڕی سوفیان، عەبدواحید کوڕی زیاد، عەمرۆ کوڕی سەلەمەی هوجەینی، عەبدوالله کوڕی یەحیا کوڕی حوسەینی ڕەقاشی. بەدوای بانگەوازی زیاتر و وەڵامدانەوەی خەڵکان کەسانی وەك: موغەیرە کوڕی فەزع، عیسا کوڕی مونس، موعاز کوڕی موعاز، عەباد کوڕی عەوام، ئیسحاق کوڕی یوسفی ئەزرەق، معاویە کوڕی هەشیم کوڕی بەشیر و دەستەیەکی فراوان لەزاناکان تا ئەو جێگەی ژمارەی ئەو کەسانەی بەیعەتیان لەگەڵ بەست بۆ چوار هەزار کەس بەرز بوویەوە و ناوبانگی لەهەموو شوێنێکدا بڵاو بوویەوە. پێیان وت: ئەگەر بڕۆیتە ناو خەڵکانی بەسرە، خەڵکان دڵنیا و بێ ترس لەدەوری تۆ کۆدەبنەوە. ئەو، ڕۆشتە ماڵی باوکی مەروان موالی منداڵەکانی سولەیم لەنزیك گۆڕستانی یەشکوریان. سوفیان کوڕی معاویە بۆ سست کردنی هێزی ئەو هەوڵیدەدا.

کاتێك محەممەدی برای ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە، نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدان ئەویش شۆڕشەکەی دەستپێبکات بەڵام ئەو ترسا و لەم فەرمانە خەمبار بوو. دەستەیەك لەهاوڕێکانی گفتوگۆ و چارەسەری کێشەکەیان بۆ کرد. یەکێك لەوان وتی: بارودۆخی تۆ جێگیرە، دەڕۆیتە زیندان و و شەوانە دەرگاکەی دەشکێنیت و زیندانییەکان ئازاد دەکەیت، بۆ بەیانی دەبینی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری تۆ کۆبوونەتەوە. بەمشێوەیە ئەرخەیان بوو. وەك وتراوە، مەنسور لەدەرەوەی کوفە و سوپایەکی کەمی لەژێر دەستدا بوو.

سیان لەفەرماندەکانی بۆ لای سوفیان کوڕی معاویە لەبەسرە ڕەوانە کردبوو تا لەئەگەری دەستپێکردنی شۆڕشەکەی محەممەد، هاوکاری ئەو بۆ سەرکوت کردنی ئیبراهیم بوون.

کاتێك ئیبراهیم مەبەستی هاتنەدەرەوەی کرد، کەسی بۆ لای هاورێکەی سوفیان کوڕی حەییانی قومی نارد و ئاگاداری کردەوە. ئیبراهیم ڕۆژی یەکی ڕەمەزانی ١٤٥/ ٢٣ نۆڤەمبەری ٧٦٢ زایینی شۆڕشەکەی دەستپێکرد و مەڕ و ماڵاتی ئەو سوپای گرت و نوێژی بەرەبەیانی لەمزگەوتی گەورەی شارەکە، خوێند. دواتر رووی کردە کۆشکی فەرمانداری کەسوفیان کوڕی معاویە و دەستەیەك لەشەڕکەران، سەنگەریان تیا گرتبوو. گەمارۆی خستە سەرکۆشکەکە و سوفیان داوای ئەمانی کرد. ئیبراهیم ئەمانی پێبەخشی و ڕۆشتە ناو کۆشکەکە. ڕاخەرێکیان بۆ ڕاخست بەلاّم پێش ئەوەی دابنیشێت، با، ڕاخەرەکەی سەرەوخوار کرد. خەڵك ئەم ڕووداوەیان بەشێوەیەکی خراپ لێکدایەوە. ئیبراهیم وتی: ئێمە باوەڕمان بەلێکدانەوەی چاك و خراپ نییە. لەسەر ڕاخەرەکە دانیشت و فەرماندەکانی زیندانی کرد و بەشێوەیەکی نە زۆر توند، دەست و پێی ئەوانی بەستەوە. یەکێك بەهاوەڵانی مەنسور، لەزیندانی بوونی سوفیان کوڕی معاویە ئاگاداری کردەوە.

هەواڵی شۆڕشەکەی ئیبراهیم بەجەعفەر و محەممەد، کوڕەکانی سلێمان کوڕی عەلی گەیشت و ئەم دووانە لەگەڵ شەشسەد پیاوی شەڕکەر، بەمەبەستی شەڕ کردن بەرێکەوتن. ئیبراهیم یەکێك لەهاوەڵانی خۆی، مەزا کوڕی قاسمی جەزری لەگەڵ پەنجا شەڕکەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد کەشکستیان پێهێنان. ئیبراهیم فەرمانی بەجاڕچییەکدا کەجاڕیدا: شوێن هیچ هەڵاتوێك نەکەون و زیان لەبریندارەکان نەدەن.

ئیبراهیم خۆی ڕۆشتە بەردەم ماڵی زێنەب کچی سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس کەزێنەبییەکانی عەباسی، ڕەچەڵەکیان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. داوای ئەمانی کرد و فەرمانیدا هیچ کەس زیانیان لێنەدات. بەمشێوەیە بەسرە، بێ شەر و ئاژاوەی زۆر، کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیبراهیم. لەگەنجخانەی شارەکە، دوو هەزار هەزار (دوو ملیۆن) دیرهەمی دەستکەوت. بەمشێوەیە هێز و دەسەڵاتی فراوان بوو. بۆ هەرکام لەهاوەڵانی، مووچەی پەنجا پەنجای دیاری کرد.

کاتێك بەسرە ئارام بوویەوە، موغەیرەی بۆ ئەهواز نارد کەدووسەد پیاوی شەڕکەر هاورێیەتیان دەکرد. محەممەد کوڕی حوسەین کارگوزاری مەنسور لەو شارە بوو. بەسوپایەکی چوار هەزار کەسی ڕووبەڕووی موغەیرە بوویەوە. شەڕی دەستی پێکرد و کوڕی

حوسەین شکستی خوارد. موغەیرە ڕۆشتە ناو ئەهواز. دەڵێن: دوای ئەوە موغەیرەی بەرەو باخمورا ڕەوانە و عەمرۆ کوڕی شەدادی بۆ پارس نارد کەڕۆشتە ناو شارەکە و لەوێ ئیسماعیل و عەبدسەمەد کوڕەکانی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، ژیانیان بەسەر دەبرد و کاتێك لەئیستەخەر بوون، هەواڵی هاتنی عەمرۆیان پێگەیشت و لەبەر ئەمە، ئەم دووانە مەبەستی ڕۆشتن بۆ دارابگەرد و لەو شارەدا سەنگەریان گرت. پارێزگاری پارس کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەمرۆ کوڕی شەداد. دواتر ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله، مەروان کوڕی سەعیدی عیجلی لەگەڵ حەفدە هەزار شەرکەر بۆ واست نارد کەفەرمانداره‌کەی هارون کوڕی حومەید ئەیادی کارگوزاری مەنسور بوو. عیجلی دەستی بەسەردا گرت و مەنسور، عامیر کوڕی ئیسماعیلی موسلی لەگەڵ پێنج هەزار شەرکەر (یا بیست هەزار شەرکەر) بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. چەندین شەڕ لەنێوان ئەوان ڕوویدا و دواتر لەسەر ئاگربڕ ڕێککەوتن تا بزانن لەنێوان مەنسور و ئیبراهیم چی دەکەوێتەوە. کاتێك ئیبراهیم کوژرا، مەروان کوڕی سەعید لەوێ رایکرد و خۆی داشارد تا ئەو کاتەی سێبەری مەرگ، باڵی بەسەردا بلاو کردەوە.

ئیبراهیم لەبەسرە بوو و کارگوزاران و سوپاکەی خۆی بۆ کەنارەکانی ئیمپراتۆری عەرەبەکان ڕەوانە دەکرد تا ئەوەی لەهەواڵی مەرگی براکەی، سێ ڕۆژ پێش جەژنی قوربان/ ١٩ ژانویەی ٧٦٣ زایینی، ئاگادار بوویەوە. ڕۆژی جەژن لەگەڵ خەڵکان هاتەدەر بەڵام نیشانەکانی تێکشکان بەروخساریەوە دیار بوو. لەگەڵ ئەوان بۆ نوێژ ریزی بەست، وتارێکی پێشکەش کردنەوە و لەکوژرانی محەممەد ئاگاداری کردنەوە. ئەوان بۆ شەڕکردن لەگەڵ مەنسور، بوێرتر بوون. بۆ بەیانی، لەدەرەوەی شار، لەشکرگەی هەڵدا و نومەیلەی وەك فەرمانداری بەسرە دەستنیشان کرد و لەگەڵ ئەو، حەسەنی کوڕی.

## بەرێکەوتنی ئیبراهیمی کوژرانی ئەو

دواتر ئیبراهیم مەبەستی ئەوەی کرد بەمەبەستی شەڕکردن بڕواتەدەر. هاوڕێکانی لەخەڵکی بەسرە پێیان وت: باشترە خۆت لەبەسرە بمێنیتەوە و سوپاکە ڕەوانە بکەیت بۆ ئەوەی ئەگەر جارێك سوپایەکی تۆ شکستی خوارد، سوپایەکی دیکە، بۆ هاوکاری ئەو بنێریت تا ترسی تۆ لەدڵی دوژمندا دروست ببێت. تۆ سامانەکان کۆبکەوە و فراوانی بەدەسەڵاتی خۆت ببەخشە. هاوڕێکانی لەخەڵکانی کوفە، پێیان وت: خەڵکانێك لەکوفەدا ژیان بەسەر

دەبەن کەئەگەر تۆ ببینن، لەرێگەی تۆدا گیان دەبەخشن و ئەگەر نەتبینن، بەهۆکاری جۆراوجۆر، لەهاوکاری کردنی تۆ پاشەکشێ دەکەن. ئیبراهیم لەبەسرەوە بەرەو کوفە بەرێکەوت.

کاتێك ئیبراهیم دەرکەوت، مەنسور سوپایەکی کەمی لەژێر فەرماندا بوو. رۆژێك وتی: سوێند بەخوا نازانم چیبکەم. لەلەشکرگەکانی من تەنیا دوو هەزار شەرکەر دەبینرێت. لەبەختی رەشی من، شەرکەرانی خۆم لەناو سنوری ولاّتی ئیسلامیدا بلاّو کردۆتەوە، سی هەزار کەسیان لەشاری رەی و لای مەهدین، چل هەزار کەسیان لەگەڵ محەممەد کوری ئەشعەس لەئەفریقیە و شەرکەرانی دیکە لەگەڵ عیسا کوری موسان. ئەگەر لەدەست ئەم رووداوە بێزارکەرە رزگارم بێت، سوێند بەخوا زیاتر لەسی هەزار شەرکەر، بۆ دەرەوەی پایتەختەکەم رەوانە ناکەم.

دواتر نامەی بۆ عیسا کوری موسا نووسی و فەرمانی پێدا بەخێرایی خۆی بگەیەنێت. نامەکەی کاتێك بەدەستی عیسا گەیشت کەبۆحەج خۆی ئامادە کردبوو. حەجەکەی پشتگوێ خست و گەرایەوە. نامەی بۆ سەلەم کوری قوتەیبە نووسی تا لەشاری رەی یەوە پەیوەستی بێت. مەنسور پێی وت: بۆ شەری ئیبراهیم بەرێکەوە، نابێت ژمارەی فراوانی سوپاکەی ئەو، تۆ بترسێنێت چوونکە سوێند بەخوا ئەم دووانە بێ گومان دوو وشتری منالّەکانی هاشم کەبێ گومان سەریان دەبردرێت! بەوتەکانی من، دلگەرم بە. فەرماندەکانی دیکەی پەیوەستی ئەو کرد. نامەی بۆ مەهدی نووسی و فەرمانی پێدا تا خەزیمە کوری خازم بۆ ئەهواز بنێرێت. ئەو، خەزیمەی لەگەڵ چوار هەزار سوارە بۆ ئەهواز نارد و شەری لەگەڵ موغەیرە دەستپێکرد. موغەیرە بۆ بەسرە گەرایەوە و خەزیمە، رێگەی بەشەرکەرانیدا بۆ ماوەی سێ رۆژ شاری ئەهواز تالاّن بکەن.

گرفتارییەکان لەهەموو کەنارەکانەوە، لەبەسرە، ئەهواز، پارس، مەداین و سواد، یەك لەدوای یەك بەسەر مەنسوردا دەبارین. لەشاری کوفە سەد هەزار شمشێر وەشێن دەژیان کەوەك دەریا دەخرۆشان و چاوەروانی هاوارێك بوون بۆ ئەوەی بناغەی عەباسییەکان، دژەکانی شۆرشی سەراسەری جیهانی ئیسلام، لەناو ببەن. کاتێك هەوالّە جۆراوجۆرەکان لای ئەو کەلّەکە بوون، ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

و جعلت نفسی للرماح دریئة          ان الرئیس لمثل ذاك فعول

یانی: گیان و جەستەی خۆم بۆ رمە جەنگییەکان تەرخان کرد. تەنیا سەروەران دەتوانن

ئەو کارانە بکەن.

دواتر بۆ هەر ناوچەیەك، بەردێکی شیاوی هاویشت. مەنسور پەنجا رۆژ لەشوێنی مانەوەی خۆی مایەوە و بەردەوام دەخەوت. لەسەر تەختەکەی دادەنیشت و عابایەکی رەنگین و چڵکنی لەبەردا بوو کە نەدەیشۆرد و نەدەیگۆڕی. بەمشێوەیە خۆی نیشانی خەڵکان دەدا. جل و بەرگی رەشی دەپۆشی و کاتێك ئەوانی بەجێدەهێشت، دووبارە جلەکانی پێشووی لەبەر دەکردەوە. لەمەدینەوە، دوو ژنی جوانیان وەك دیاری بۆ هێنابوو، یەکیان فاتیمە کچی محەممەد کوڕی عیسا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله و ئەوی دیکەیان دایکی کەریم کچی عەبدوالله لەباوکی خالید کوڕی ئوسید. لەم دووانە نزیك نەکەوتەوە. پێیان وت: ئەم دوو کچە جوانە گومانیان لا دروست بووە (کەپیاوەتیت نەماوە): وتی: ئەمڕۆ کاتی نزیك بوونەوە لەژنە جوانەکان نییە و من، ناڕۆمە لای ئەوان تا ئەو کاتەی سەری ئیبراهیمم بەدیاری بۆ دێنن، یا سەری من بەدیاری بۆ ئەو دەبەن.

حەجاج کوڕی قوتەیبە دەڵێت: کاتێك گرفتارییەکانی مەنسور فراوان بوو، بۆ سڵاو کردن لەو، رۆشتمە لای و بینیم هەواڵەکانی تایبەت بەبەسرە و ئەهواز و پارسیان بۆ هێناوە و سوپاکەی ئیبراهیم فراوان و لەکوفە سەد هەزار شەڕکەر لەنزیك مەنسور کۆبوونەتەوە و چاوەڕوانی هاوارێك دەکەن تا هێرشی بکەنەسەر. بینیم بەردەوام ئامادەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشە و گرفتارییە گەورەکان و پیاوانە لەبەرابەر ئەم گرفتانە، خۆڕاگری دەکات و هەڵیاندەسەنگێنێت. خۆڕاگری کرد و نەکەوتە سەر چۆك. بەو شێوەبوو کەپێشینان وتوویانە:

نفس عصام سودت عصاما و علمته الکر و الاقداما

و صیرته ملکا هماما

یانی: گیانی و ناخی عیسام بوو سەروەری پێبەخشی و پێشەنگی و پێشڕەوی فێر کرد و ئەوی کردە پاشایەکی ئازادە.

مەنسور، عیسا کوڕی موسای لەگەڵ پانزە هەزار شەڕکەر بۆ شەڕی ئیبراهیم رەوانە کرد و فەرماندەی پێشەنگەکانی بەحومەید کوڕی قەحتەبە سپارد و سێ هەزار شەڕکەری خستە بەردەست. کاتێك ماڵئاوایی لێکرد، پێی وت: ئەم خراپە خوازانە یانی ئەستێرە ناسەکان گومان دەکەن کاتێك تۆ رووبەرووی ئیبراهیم دەبیتەوە، سوپاکەت هێرش دەبەن و تۆ،

گرفتاری شەڕ دەکەن، دواتر دەگەڕێنەوە بەڵام ئەنجامەکەی لەبەرژەوەندی تۆدایە.

کاتێك ئیبراهیم بەرێکەوت، شەوانە پێشڕەوی دەستپێکرد. لەناوەڕاستی شەو، بەناو سوپاکەی خۆیدا گەڕا و دەنگی تەبیرەی بیست. جارێکی دیکە بەناو سوپاکەدا گەڕا و هەمان دەنگی بیست. وتی: گومان ناکەم سوپایەك کەتەپڵ و دەهۆڵ بژەنێت، بتوانێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت. لەرێگادا لەویان بیست کەهۆنراوەکانی قەتامی لەژێر لێوەوە دەخوێنێت:

| | |
|---|---|
| امور لو تدبرها حليم | اذا لنهى و هيب ما استطاعا |
| و معصية الشقيق عليك مما | يزيدك مره منه استماعا |
| و خير الامر استقبلت منه | و ليس بان تتبعه اتباعا |
| و لكن الاديم اذا تفرى | بلى و تعيبا غلب الصناعا |

یانی: چەندین کار هەیە ئەگەر فرمزانێك بەوردی لێیان رابمێنێت، خۆی دەگرێت و تا ئەو جێگەی دەتوانێت، خۆپارێزی دەکاتە پیشە. نافەرمانی هاورێی میهرەبان لەم کارە دژوارانە و بینی دەرئەنجامەکانی، زیاتر ناچارت دەکات گوێ لەوتەکانی بگریت و بۆ بەکار بردنی ئامۆژگارییەکانی ئەو، هەوڵ بدەیت. باشترین کار ئەوەیە پێشوازی لێبکەیت نەك ئەوەی بەدوای ئەودا بەرێکەویت. بەڵام کاتێك راخەرەکە کۆن و دەرزێت و لەت لەت دەبێت، چاککردنەوەی کارێکی ئەستەم دێتە بەرچاو.

زانیان کە لەبەرێکەوتنی خۆی پەشیمانە بۆتەوە.

دیوانی ئەو، ناوی سەد هەزار شەڕکەری تۆمار کردبوو. دەڵێن: لەکاتی رۆشتن، زیاتر لەدە هەزار کەس، هاورێیەتی ئەویان نەدەکرد. لەرێگادا پێیان وت بەرێگەیەکدا بڕوات کەرووبەرووی عیسا نەبێتەوە. بەرەو کوفە بڕوات چوونکە مەنسور لەو شارەدا دەسەڵاتی فراوان نییە و خەڵکانی کوفە، بەدڵ و گیانەوە پەیوەستی دەبن و بەمشێوەیە تەنیا حیلوان لەدەستی مەنسوردا دەمێنێتەوە. بەڵام رازی نەبوو. پێیان وت بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر سوپاکەی عیسا. وتی: پەسەندی ناکەم بێ ئاگادار کردنەوە، شەر دەستپێبکەم.

یەکێك لەخەڵکانی کوفە ویستی ئامۆژگاری بکات بۆ ئەوەی روو بکاتە کوفە و پێشنیاری فەرمانبەری کردنی خۆی بەخەڵکان بدات. وتی: سەرەتا بەشێوەیەکی نهێنی و دواتر بانگەوازەکەی خۆم، ئاشکرا دەکەم. کاتێك مەنسور دەنگی شۆڕش لەکوفە ببیستێت، لەحیلوان دوور ناکەوێتەوە. لەبەر ئەمە لەگەڵ (بەشیری ئامۆژیاری جیهان) راوێژی کرد. وتی: ئەگەر بەوەی دەیڵێیت، دڵمان خۆش بکەین، ئەگەری هەیە ئەندێشەیەکی شیاو بێت. بەڵام لەوە

دڵنیا نیم کەژمارەیەکی کەم لەوان پەیوەستی تۆ ببن و ئەوکات، مەنسور سوار شەڕکەرەکان بۆ لەناو بردنی ئەوان ڕەوانە و بێ گوناح و منداڵ و ژن، پێکەوە کوشتار بکات چوونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئابرووچوون. پیاوی کوفی وتی: ئێوە بۆ شەڕ و کوشتاری سوپاکەی مەنسور ڕێگە دەبڕن و ئەوسا، لەکوشتنی خەڵکانی ناتەوان و پەککەوتە خۆتان بەدوور دەگرن! مەگەر پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕ نەدەڕۆشت و فەرمانی کوشتاری خەڵکانی بەسوپاکەی دەدا و ئەم پێشهاتانە ڕوویان دەدا؟ بەشیر وتی: ئەوان ناباوەڕ بوون و ئەمان باوەڕدار.

ئیبراهیم گرنگی بەبۆچوونەکەی خۆیدا و درێژەی بەڕێگەدا تا ئەوەی لەباخمرا دابەزی. دووری ئەم شوێنە لەکوفە شانزە میل بوو. لەبەرابەر عیسا لەشکری لێدا. سەلەم کوڕی قوتەیبە کەسی بۆ لای ئەو نارد و پەیامیدا: تۆ خۆت و سوپاکەت بردۆتە دەشت و بەرێزتر لەوەیت دەستی مەرگ بەئاسانی باوەشت بۆ بکاتەوە. خەندەکێك بەدەوری خۆتا هەڵکەنە و تەنیا یەك ڕێگە بهێڵەرەوە. ئەگەر ئەم کارە ناکەیت، ئاگاداربە کەمەنسور سوپاکەی فریوداوە و تەنیا لەگەڵ ژماردیەکی کەم هاتۆتەدەر. دەتوانیت بڕۆیتە پشتی سوپاکەی و هێرشی بکەیتەسەر. ئیبراهیم هاوەڵانی خۆی بانگ کرد و سەبارەت بەم پێشنیارە بۆچوونی ئەوانی وەرگرت. وتیان: ئێمە سەرکەوتووین، بۆ لەدەروی خۆمان خەندەك هەڵکەنین! سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەین. وتی: کەواتە با هێرش بکەینە سەر مەنسور و بیگرین. وتیان: بۆ؟ ئەو لەدەستی ئێمەدایە و کەی بخوازین، دەیگرین. ئیبراهیم بەنێردراوەکەی وت: ئایا دەبیستیت؟ نێردراو گەڕایەوە.

هەردوو لای شەڕکەر، ریزیان بەست، ئیبراهیم بەیەك ریز سوپاکەی ئامادە کرد. دەستەیەك لەهاوەڵانی پێشنیاریان کرد بۆ چەندین دەستەی شەڕکەر دابەشیان بکات تا لەئەگەری شکستی دەستەیەك، دەستەکانیتر بەبەهێزی بمێننەوە چوونکە بەم شێوەیە ئەگەر بەشێك یا دەستەیەك شکست بخوات، ئەوانی دیکەیش گرفتار دەکات. کەسانیتر وتیان: تەنیا هاوشێوەی سەربازانی ئیسلام شەڕ دەکەین و ئەمە فەرموودەی خواوەندی گەورەیە کەدەفەرمێت: خواوەند، ئەو کەسانەی لەڕێگەی ئەودا شەڕدەکەن، بەئەندازەیەك خۆش دەوێت کە بەیەك ریز، هاوشێوەی دیوارێکی بەهێز، شەڕ دەکەن.

شەڕ دەستپێکرد و بەرەو دژواری ڕۆشت. حەمید کوڕی قەحتەبە شکستی خوارد و خەڵکان بەدوای ئەودا. عیسا سوێندیدان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە و پێشنیاری فەرمانبەری پێکردن، بەڵام خەڵکان هەڵدەهاتن و ئاوڕیان نەدەدایەوە.. حەمید، تێکشکاو گەڕایەوە. عیسا

پێی وت: خوا، خوا، فرمانبەری بکە. حەمید وتی: لەگەرماوگەرمی شکست، باس کردنی فەرمانبەری، هەڵیت و پڵیتە. خەڵکان بەرێکەوتن و عیسا لەگەڵ چەند کەسێك مایەوە. پێیان وت: چی دەبێت ئەگەر شوێنەکەی خۆت بەجێبێڵێت بۆ ئەوەی خەڵکان بگەڕێنەوە و دووبارە هێرش بکەیتە سەریان. وتی: سوێند بەخوا، لەشوێنەکەی خۆم ناجووڵێم تا ئەوەی دەکوژرێم یا ئەو ناباوەڕە دەکوژم. سوێند بەخوا هیچ کات بنەماڵەکەم بەتێکشکاوی من نابینن و بەهەڵاتوو بانگم ناکەن. هەرکەس لای ئەو تێدەپەڕی، پێی دەوت: سڵاوم بەبنەماڵەکەم بگەیێنە و پێیان بڵێ: بۆ ئێوە هیچ قوربانییەکەی گرانبایترم لەگیانم نەبینی کەلەرێگەی ئێوەدا بەخشیم.

لەم کاتەدا، جەعفەر و محەممەد کوڕەکانی سلێمان کوڕی عەلی لەپشتەوە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی ئیبراهیم. شەڕکەرانی ئیبراهیم کەشوێن هەڵاتوان کەوتبوون، ئاگایان لەم ڕووداوە نەبوو تا ئەوەی دەستەیەکیان ئاوڕیان دایەوە و ئاگری شەڕیان بینی و بۆ لای ئیبراهیم گەڕانەوە. شەڕکەرانی مەنسور شوێنیان کەوتن تا ئەو کاتەی بەشێوەیەکی سەراسەری شکست لەناو سوپاکەی ئیبراهیمدا بڵاو بوویەوە. ئەگەر جەعفەر و محەممەد نەدەبوون، سوپاکەی مەنسور لەناو دەچوو. یەکێك لەبەرەکەتەکانی خواوەند بۆ مەنسور ئەوە بوو کە: شەڕکەرانی لەکاتی هەڵاتن گەیشتنە ڕووبارێك بەڵام پرد یا شوێنی پەڕینەوەیان دەست نەکەوت لەبەر ئەمە هەموویان گەڕانەوە. ئیبراهیم لەپشت خۆیەوە خەندەکێکی هەڵکەندبوو و بەئاو، پڕی کردبوویەوە بۆ ئەوەی تەنیا لەیەك قۆڵەوە شەڕ بکەن. کاتێك شکستیان خوارد، ئاو، ڕێگەی هەڵاتنی ئەوانی گرت و ئیبراهیم لەگەڵ شەشسەد شەڕکەر مایەوە. دەستەیەك دەڵێن: چوارسەد کەس بوون. حەمید بەبەردەوامی شەڕی دەکرد و سەرە براوەکانی بۆ عیسا دەنارد. ئیبراهیم تیرێکی لەتیرهاوێژێکی نەناسراوەوە بەرکەوت کە لەقوڕگی چەقی. وتی: دامبەزێنن. ئەویان لەچوارپێکەی هێنایە خوار، بەردەوام دەیوت: فەرمانی خواوەند دەبێت ئەنجام بدرێت. ئێمە شتێکمان ویست و خواوەند، شتێکی دیکە.

هاوەڵە نزیکەکانی لەدەوری ئەو کۆبوونەوە و بەرگریان لێکرد. حەمید کوڕی قەحتەبە، بەهاوەڵانی خۆی وت: هێرش بکەنە سەر ئەو دەستە و لەشوێنی خۆیان دووریان بخەنەوە. بزانن لەدەوری کێ کۆبوونەتەوە و لەگەڵ کێ شەڕ دەکەن. هێرشیان کردنەسەر و شەڕێکی دژوار دەستپێکرد. هاوەڵانی ئیبراهیم، ناچارکران دەوری ئیبراهیم چۆڵ بکەن. شەڕکەرانی

حەمید، ئیبراهیمیان گرت و سەریان بڕی و بۆ عیسایان برد کە نیشانی باوکی کەرامی جەعفەریدا. وتی: بەڵێ، سەری ئیبراهیمە. عیسا دابەزی و سەری لەخاك سوو و کوڕنوشی بۆ خواوەند برد. سەری ئیبراهیمی بۆ مەنسور ڕەوانە کرد بەلام لەم کارەی، بەتەواوی بێزار و شەکەت ببوو.

کوژرانی ئەو لەرۆژی دووشەممە، پێنج شەو بۆ کۆتایی هاتنی مانگی زی قەعدە ١٤٥/ ١٤ فەوریەی ٧٦٣ زایینی، روویدا. ساڵەکان ژیانی ٤٨ ساڵ درێژەی کێشا. لەکاتی دەستپێکردنی شۆڕشەکەی تا رۆژی کوژرانی، سێ مانگ و پێنج رۆژی خایاند.

دەستەیەك دەڵێن: هۆکاری شکستەکەی ئەوە بوو کاتێك سوپاکەی مەنسور شکستیان خوارد و لەشکرەکەی ئیبراهیم شوێنیان کەوتن، جارچی ئیبراهیم جارپیدا: شوێن هەلاتوان مەکەون. ئەوان، گەڕانەوە. کاتێك هەلاتوانی سوپاکەی مەنسور بینیان سوپاکەی ئیبراهیم دەگەڕێنەوە، هەستیان بەشکستی ئەوان کرد و گەڕانەوە و لەبەر ئەمە شکست لەناو سوپاکەی ئیبراهیم بلاّو بوویەوە.

کاتێك هەواڵی یەکەم شکست، بەمەنسور گەیشت، مەبەستی ئەوەی کرد بەرەو رەی بڕوات. نەوبەختی ئەستێرەناس رۆشتە لای و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سەرکەوتنی کۆتایی بەتۆ دەبڕێت و ئیبراهیم، لەزووترین کاتدا دەکوژرێت. مەنسور رازی نەبوو. سەرقاڵی ئەم گفتوگۆیە بوون کەهەواڵی کوژرانی ئیبراهیمی پێگەیشت. ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

فالقت عصاها و استقرت بها الندی كما قر عينا بالاياب المسافر

یانی: داردەستەکەی فڕێدا و لەشوێنەکەی خۆی ئارامی گرت وەك بڵێی ڕێبووارێك لەرێگەی دوورەوە هات و چاوەکانی لەسەیر کردنی خان و مان، شادامان بوو.

مەنسور هەزار جەریب (٦٧٥٠٠٠ میتری چوارگۆشە) زەوی گرانبایی لەکەناری روباری حوەیزەی بەنەوبەختی ئەستێرەناس بەخشی.

سەری براوی ئیبراهیمیان بردە لای مەنسور. لەبەردەم خۆیدا داینا. کاتێك بەجوانی سەیری کرد، بەکوڵ گریا و فرمێسکەکانی کەوتە سەر روخساری ئیبراهیم. وتی: سوێند بەخوا خوازیاری ئەمە نەبووم بەلام چارەنوسی منی گرفتاری تۆ کرد و تۆی گرفتاری من. دواتر فەرمانی کۆبوونەوەی خەڵکانی دەرکرد. خەڵکان دەهاتن و جوێنیان بەئیبراهیم دەدا و پیرۆزباییان لەمەنسور دەکرد. مەنسور کەسێکی خۆڕاگر بوو بەلام رەنگی روخساری بەردەوام دەگۆڕا. تا ئەو کاتەی جەعفەر کوڕی حەنزەلە دارمی هاتە ناو، وەستا و سلاّوی

کرد و ئەم وتەی هێنایە سەرزمان: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند پاداشتی تۆ لەپرسەی کوڕە مامەکەت پێببەخشێت و ئەویش ببەخشێت کەوەڵامی چاکەی تۆی نەدایەوە. لەم کاتەدا روخساری مەنسور کرایەوە و پێی وت: دەسخۆش، بەخێر بێیت ئەی باوکی خالید. نزیك بەرەوە. خەڵکان زانییان چ وتەیەك دەبێتە هۆکاری شادمانی مەنسور. ئەوانیش ئەو کارەیان کرد.

دەڵێن: کاتێك سەریان خستە سەرزەوی، پیاوێك تفی تێکرد. مەنسور فەرمانیدا سەر و لووتی ئەو بەدار بشکێنن. دواتر فەرمانیدا لەکۆشك فڕێبدەنەدەر.

دووبارە دەڵێن: رۆژێك مەنسور، سەیری سوفیان کوڕی معاویەی (بکوژەکەی ئیبراهیم) کرد. ئەوی سوار لەسەر ئەسپ بینی و ئەمە ماوەیەك دوای کوژرانی ئیبراهیم بوو. وتی: سەرسورهێنەرە کارەکانی خواوەند، چۆن ئەم رووسپی زادە لەدەستی من رادەکات.

بەسەرهاتی ئیبراهیم کۆتایی پێهات.

## بیر کردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا تورکان و خەزەرەکان لە باب ئەبواب، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەستەیەکی فراوانیان لەموسوڵمانەکانی نیشتەجێی ئەرمەنستان کوشتار کرد.

عەبدوالله کوڕی حارس کوڕی عەباس، لەم ساڵەدا حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو، فەرمانداری مەککە بوو.

فەرمانداڕەکان ئەم کەسانە بوون: فەرمانداری مەککە، سەری کوڕی عەبدوالله، فەرمانداری مەدینە، عەبدوالله کوڕی رەبیع، فەرمانداری کوفە، عیسا کوڕی موسا، فەرمانداری بەسرە، سەلەم کوڕی قوتەیبەی باهلی، سەرپەرەستی دامەرزاوەی دادی بەسرە، عەباد کوڕی مەنسور و فەرمانڕەوای میسر، یەزید کوڕی حاتەم بوون.

لەم ساڵەدا مەنسور، مالك کوڕی هەیسەوی لەفەرمانڕەوایەتی موسڵ لابرد و کوڕەکەی، جەعفەر کوڕی ئەبی جەعفەری مەنسوری وەك فەرمانداری ئەو شارە دەستنیشان و حەرب کوڕی عەبدوالڵەی کە یەکێك لەفەرماندە بەناوبانگەکانی بوو، لەگەڵ ئەودا رەوانە کرد. ئەو، خاوەنی حەربیەی بەغدادە. لەخوارەوەی شاری موسڵ کۆشکێکی دروست کرد و ژیانی لەوێ بەسەر برد. هێشتا ئەو شوێنە، بەکۆشکەکەی حەرب ناو دەبەن.

هەروەها لەم ساڵەدا، زوبەیدە کچی جەعفەر، هاوسەری هارون ئەلڕەشید چاوی بەدنیا

هەڵهێنا.

لەوێ لەرۆژگاری ئێمە، گوندێکە کەسامانی ئێمە بوو و ئێمە لەوێ، خانەقایەکمان بۆ سۆفییەکان دروست کرد. زۆرینەی ئەم نووسراوەمان (تەواوی مێژوو) لەم گوندە و لەماڵەکەی خۆمان کۆکردەوە. ئێرە، پاکترین و خۆشترینی جێگەکانی سەرزەوییە. پاك و گەورەیە ئەو خواوەندەی پایەدار دەمێنێتەوە و سوڕانی رۆژگار، هیچ نیشانەیەك بەیادگاری بۆ ئەو بەجێناهێڵێت.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەمرۆ کوڕی مەیمون کوڕی میهران، حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب، مەرگی ئەو لەزیندانی مەنسوردابوو چوونکە ئەوی لەمەدینە دەستگیر کرد بەهەمان شێوە کەباسمان کرد. ئەو مامی محەممەد و ئیبراهیم بوو. عەبدولەلیك کوڕی ئەبی سلێمانی عەزرەمی، یەحیا کوڕی حارسی زەماری لەتەمەنی حەفتا ساڵی، ئیسماعیل کوڕی ئەبی خالیدی بەجلی، باوکی شەهید حەبیب کوڕی شەهیدی موالی ئەزدییەکان.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی نۆیەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٠

# بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب : تەواوی مێژوو

بابەت :مێژوویی

بەرگی: نۆیەم

**نوسینی: ئیبن ئەسیر**

**وەرگێڕانی: زاهیر محەممەد رەشید**

تایپ: نژۆ مستەفا

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠١٠

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان

تیراژ :١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن (   ١٢٥٢ ) ساڵی (٢٠٠٨) پێدراوە

# پێڕست

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و شەشی کۆچی ((٧٦٣ زایینی)

## کۆچ کردنی مەنسور بۆ بەغداد و چۆنیەتی دروست کردنی شارەکە

لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر/ ئاوریلی ٧٦٣ زایینی، ئەبو جەعفەری مەنسور لەشارستانی کوڕی هوبەیرە بۆ شاری بەغداد کۆچی کرد و لەرێگە هەوڵەکانی بۆ کۆتایی هێنان بەتەواو کردنی شارەکە چڕ کردەوە. لەکاتی ئاماژەدان بەرووداوەکانی ساڵی ١٤٥ کۆچی/ ٧٦٢ زایینی هۆکارەکانی مەنسورمان بۆ دروست کردنی شاری بەغداد باس کرد و هەنووکە چۆنیەتی دروست کردنەکەی باس دەکەین.

کاتێك مەنسور بڕیاریدا شاری بەغداد بنیات بنێت لەگەڵ هاورێیانی خۆی راوێژی کرد. خالیك کوڕی بەرمەکیش ئامادە بوو. ئەویش دروست کردنی شارەکەی پشتڕاست کردەوە و نەخشەی شارەکەی کێشا. راوێژی لەگەڵ کرد تا مەداین و ئەیوانی خوسرەو وێران بکات و نیگارەکانی بیناسازی ئەو شارە بۆ بەغداد بگوازێتەوە. خالید وتی: بۆچوونی لەوشێوە پەسەند ناکەم چوونکە نیشانەیەك لەنیشانەکانی ئیسلامە و بینەر بەبینینیان هەست دەکات خاوەنەکانی، بەبزوێنەرێك لەبزوێنەرانی ئەم جیهانە نەیاندەتوانی لەوێ دەربکرێت بەڵکو ئەمە، لەخۆگری ئاین و دین و بزوێنەرەکانی ئاهورایی و فەرمانی دینی بووە. جیاواز لەوە، نوێژگەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوێیە. مەنسور وتی: بەوشێوە نییە، ئەی خالید، ئەم وتارە لەئارەزوومەندیت بۆ هاورێی ئێرانییەکان سەرچاوەی گرتووە! فەرمانیدا سەرەتا کۆشکی سپی وێران بکەن و ستوونەکانی بۆ شاری بەغداد بگوازنەوە. سەیری ئەوانی کرد و بینی خەرجی گواستنەوەی ئەوان زیاترە لەبەهای کڕینی ئاسن. خالیدی بانگ کرد و لەمە ئاگاداری کردەوە. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، پێشتر لەنەکردنی ئەم کارە ئاگادارم کردیتەوە، بەڵام کاتێك دەستت پێکرد بۆچوونم وایە وێرانی بکەیت تا نەڵێن: لەوێران کردنی ئەوەی کەسانیتر دروستیان کردووە، ناتەوان بوویت.

دەروازەکانی شاری واستی هەڵگرت و لەدەروازەکانی شاری بەغداد داینا. دەروازەیەکی دیکەیان لەشامەوە هێنا و دەروازەیەکی دیکە لەکوفەوە کەخالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسری دروستی کردبوو. شارەکەی بەشێوەیەکی بازنەیی و خڕ دروست کرد تا بەشێك لەخەڵکان زیاتر لەکەسانی دیکە لەدەربای پاشاوە نزیك نەبن. دوو بورجی دروست کرد. بورجی ناوەوە لەوەی دەرەوە گەورەرتر دەهاتە بەرچاو. کۆشکی پاشایەتی لەنێوان دوو بورجەکە و مزگەوتی هەینی لەتەنیشت کۆشکەکە دروست کرد.

حەجاج کوڕی ئەرتات نەخشەی مزگەوتەکەی کێشا، قیبلەکەی راست نەبوو و نوێژخوێن ناچار رووی دەکردە کۆشکەکە و دەروازەی بەسرە چوونکە دوای کۆشکەکە دروستیان کردبوو و کۆشکەکە بەتەواوی رووەو قیبلە نەبوو.

ئەو خشتانەی بیناکانیان پێ دروست کرد، یەك گەز لەیەك گەز بوو. کاتێك وێرانیان کرد و هەڵیانسەنگاند، کێشی هەر خشتێك سەد و شانزە ڕەتڵ بوو (١٧٨٥×١١٦=٢٠٧/٠٦٥؟). کۆشکەکانی ژمارەیەك لەفەرماندەکان و دەبیرەکانی مەنسور، دەرگاکانی بەرەو گۆڕەپانی مزگەوتەکە دەکرایەوە. مامەکەی، عیسا کوڕی عەلی داوای فەرمانی لێکرد تا لەردەوازەی (کەلان) بەسواری بڕواتە ناو کۆشکەکەی. مەنسور رێگەی پێنەدا. عیسا وتی: من وەك ئاوکێشێك ببینە. مەنسور فەرمانیدا دەروازەکانی کۆشکیان لەناو دەروازەی کەلان بۆ ئەیوانچەکانی دەرەوەی مزگەوت و کۆشك بسوڕێنن.

بازارەکان لەناو شارەکەدا بوون. جارێك نێردراوێکی پاشای ڕۆم ڕۆشتە شارەکە و مەنسور فەرمانیدا بەناو شارەکەدا بیگەڕێنین. مەنسور پرسی: شارەکەت چۆن بینی؟ وتی: بینایەکی جوانم بینی بەڵام دوژمنەکانت (بازاڕییەکان) لەنزیك تۆدان. کاتێك نێردراو گەڕایەوە، مەنسور فەرمانیدا ئەوان بۆ پانتاییەکانی کەرخ دوور بکەنەوە.

دەستەیەك دەڵێن: لەبەر ئەوە ئەوانی دەرکرد چوونکە بێگانەکان بەئاسانی پێیان بۆ ئەوێ دەکرایەوە و زۆربەی کات لەوێ دەخەوتن. لەبەر ئەمە گومانی کرد ئەگەری هەیە سیخوڕەکان لەناو ئەواندا بن.

دەڵێن: مەنسور بەدوای شوێنکەوتەکانی ئیبراهیم کوڕی عەبدوڵڵاوە بوو. شوێن پێی ئەوانی هەڵدەگرت. باوکی زەکەریا یەحیا کوڕی عەبدوڵڵا فەرمانداری ئەمنییەتی شاری بەغداد بوو و تا ئەندازەیەك ئارەزووی پەیوەست بوون بەئیبراهیمی دەکرد. ئەو دەستەیەك لەژێردەستەکانی کۆکردەوە و دژی مەنسور ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و بەدەنگی بەرز ئیهانە و جوێنیان پێدا. ئەوانی هێور کردەوە و باوکی زەکەریایی گرت و کوشتی و بازارەکانی دوور خستەوە. خەڵکان سەبارەت بەمیوە و سەوزە فرۆشەکان قسەیان لەگەڵ کرد. فەرمانیدا لەهەر بازارێك تەنیا یەك سەوزە فرۆش و یەك میوە فرۆش بوونی هەبێت تا سەوزی و سرکە بفرۆشن.

پانایی ڕێگەکانی بەچل گەز دیاری کرد.

خەرجی بنیاتنانی بەغداد، مزگەوتەکان، کۆشکەکان، کۆڵانەکان، بازارەکان و دەروازەکانی شارەکە، چوارهەزار هەزار و هەشتسەد و سی و سێ (٤٬٠٠٠٬٨٣٣) درەم بوو. کرێی وەستا کارامەکان لەیەك ڕۆژ یەك قیرات( چوار جۆ و چوار دانە) سیم و کرێی ڕۆژکار، دوو دانە بوو. کاتێك کارەکە کۆتایی پێهات، سەرکرێکارانی ژمارد و هەموو پارە زیادەکانی لێ سەندنەوە. تەنانەت خالید کوڕی سەڵت، پانزە درەمی کەوتە لا و ئەوی خستە زیندان تا لێوەرگرتەوە.

## شۆڕشی عەلا لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عەلا کوڕی نەعیسی یەحسوبی لەئەفریقییەوە بۆ شارێك لەئاندۆلۆس کۆچی کرد. جل و بەرگی ڕەشی پۆشی و بناغەی فەرمانڕەوای عەباسییەکانی دارِست وپێشنیاری فەرمانبەری کردنی مەنسوری بەخەڵکاندا و لەنوێژی هەینی بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە و کاروبارەکانی بەپێی خواستی ئەوان بەرێوە دەبرد و ڕۆژگاری بەخۆشی ئەوان بەسەر برد. شاهزادە عەبد ڕەحمانی ئومەوی بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. ئەم دووانە لەکۆتاییەکانی شاری سیوەیلی ئیسپانیا شەڕیان کرد. عەلا شکستی خوارد و عەبدرەحمان فەرمانی بەیەکێك لەبازرگانەکاندا سەری ئەو و سەری دەستەیەك لەهاوەڵە ناودارەکانی بۆ

کامونیا (قەیرەوان) ببەن و بەشێوەیەکی نهێنی لەبازاڕدا فڕیان بدەن. ئەو کارەیان کرد. دواتر لەوێوە بۆ مەککەیان برد و ئەمە لەکاتێکدا بوو مەنسور لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد. لەگەڵ سەرەکان، ئالآیەکی ڕەش و نامەی مەنسور بۆ عەلا دەبینرا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا سەلەم کوڕی قوتەیبە لەفەرمانداری بەسرە دوورخرایەوە.

هۆکاری لەسەر کارلابردنەکەی ئەوە بوو مەنسور نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا ماڵی هاورێ و هاوەڵانی ئیبراهیم وێران بکات کەدژی ئەو ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و باخەکانی خورمای ئەوان وێران بکات. سەلەم نووسی: لەکێوە دەست پێبکەم، ماڵەکان یا دارخورماکان؟ مەنسور لەم پرسیارە توڕە و ئەوی لەسەر کار لابرد و محەممەد کوڕی سلێمانی لەجێگەی ئەودانا. محەممەد لەبەسرە شێوەی خراپەکاری گرتەبەر و ماڵی باوکی مەروان و عەون کوڕی مالك و عەبد واحید کوڕی زیاد و کەسانی دیکەی وێران کرد.

جەعفەر کوڕی حەنزەلەی بەهرانی لەم ساڵەدا شەڕی هاوینەی ڕێکخست.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی ڕەبیعی حارسی لەفەرمانداری مەدینە دوورخرایەوە و لەجیاتی ئەو جەعفەر کوڕی سلێمان هاتە سەر کار. ئەو لەمانگی ڕەبیعی یەکەم/ مەی ٧٦٣ زایینی ڕۆشتە ئەو شارە. هەروەها فەرمانداری مەککە سەری کوڕی عەبدوالله‌یان لەسەر کار لابرد و عەبد سەمەد کوڕی عەلییان لەجێگەی ئەو دانا.

عەبد وەهاب کوڕی ئیبراهیمی ڕێبەر، لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا عوروە کوڕی زوبەیر کۆچی دوایی کرد. دەستەیەك دەڵێن: لەشەعبانی ئەم ساڵە ١٤٧ کۆچی/ ئۆکتۆبەری ٧٦٤ زایینی. تەڵحە کوڕی یەحیا کوڕی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله‌ی تەمیمی کوفی لەم ساڵەدا کۆچی دووای کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مالك کوڕی عەبدوالله‌ی خەسعەمی کەپێیان دەوت (مالك

صوایف) و یەکێك لەفەلەستینییەکان بوو، بۆ شەڕی ڕۆم ڕۆشت تالآنی زۆری کۆکردەوە و گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە پانزە میلی (دەروازەی پێشهات) گەشتە شوێنێك بەناوی (رەهوە)، سێ ڕۆژ مایەوە و تالآنییەکانی فرۆشت و بەشی خەڵکان و خەلیفەی جیا کردەوە. لەو کاتەوە ئەو ناوچەیان بەڕەهوەی مالك ناو برد.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سایبی کەلبی رەچەڵەك ناس، کۆچی دووای کرد.

## ڕووداوەكانی ساڵی سەد و چل و حەوتی كۆچی ( ٧٦٤ زایینی )

## كوژرانی حەرب كوڕی عەبدوڵڵە

لەم ساڵەدا ئەستەرخانی خوارەزمی لەگەڵ سوپایەكی گەورە لەتوركەكان لەپانتاییەكانی ئەرمەنستان هێرشیان كردە سەر موسوڵمانان و دەستەیەك لەموسوڵمانانیان هاوشێوەی ئەسیرەكان گرفتار كرد و لەخەڵكە ئەمان بەخشراوەكانیش كەسانێكیان دیل و ڕۆشتنە ناو تفلیس. حەرب لەم كاتەدا لەگەڵ چوار هەزار جەنگاوەر نیشتەجێی موسڵ و ئەو ناوچەی لەبەرابەر هێرشی خەواریج دەپاراست كە لەجەزیرە ژیانیان بەسەر دەبرد. مەنسور، جبرائیل كوڕی یەحیا و حەرب كوڕی عەبدوڵڵەی بۆ شەڕی توركەكان ڕەوانە كرد. ڕووبەڕوویان بوونەوە و جبرائیل شكستی خوارد و حەرب كوژرا و ژمارەیەكی زۆر لەشەڕكەرانی جبرائیل كوژران.

## وەرگرتنی پەیمانی فەرمانبەری بۆ مەهدی و لەسەركار لابردنی عیسا كوڕی موسا

لەم ساڵەدا مەهدی، عیسا كوڕی محەممەد كوڕی عەلی لەجێگری خەلیفە دوور خستەوە و لەخەڵك بۆ مەهدی كوڕی محەممەد پەیمانی فەرمانبەری وەرگرت.

سەبارەت بەهۆكاری دوورخستنەوەی عیسا لەجێگری، گێڕانەوەكان جیاوازن. دەڵێن: عیسا لەرۆژگاری فەرمانڕەوای (دژخیمی خوێنخۆر)تا ئێستا جێگری خەلیفە و فەرمانداری كوفە بوو. كاتێك مەهدی گەورە و گەشەی كرد و مەنسور بڕیاریدا بۆ خەلافەت بەیعەتی بۆ وەربگرێت، لەگەڵ عیسا كوڕی موسا لەمبارەوە ئاخاوت. ئەو، ڕێزی لەعیسا دەگرت و لای ڕاستی خۆی دایدەنیشاند و مەهدی لای چەپ. كاتێك مەنسور قسەی لەگەڵ كرد تا دەست لەجێگری خەلافەت هەڵبگرێت، ڕازی نەبوو، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! لەگەڵ ئەو هەموو سوێند

و پەیمانەی لەخەڵکانت وەرگرتووە، چی دەکەیت. هیچ ڕێگەیەك بۆ دوور خستنەوەی من لەجێگری نییە. مەنسور دڵگیر و ئەوی لەخۆی دوور خستەوە و تا ئەندازەیەك ریسوای کرد تا ئەو رادەی پێش ئەو. مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووری بەمەهدی دەدا و مەهدی لای راستی خۆی دادەنیشاند و دواتر مۆڵەتی ڕۆشتنە ژوورەوەی بەعیسا دەدا و لای چەپی مەنسور دادەنیشت. ئەویش هەوڵی دەدا لای چەپی مەنسور دانەنیشێت. مەنسور ڕقی ئەوی لەدڵ گرت. سەرەتا فەرمانی بەمەهدی دەدا و دواتر بەمامەکەی، عیسا کوڕی عەلی. دواتر بەعەبد سەمەد کوڕی عەلی و سەرئەنجام بەعیسا کوڕی موسا. هەندێ کات پاش و پێشی لەم کەسانەدا دەگرت جگە لەوەی پێش هەموویان فەرمانی بەمەهدی دەدا.

عیسا لەو گومانەدا بوو کەئەوان بەپێی نیازەکانی خۆی لەپێشەوە بانگ دەکات.

عیسا بەهەمان شێوە بێدەنگ بوو، سینەی دەکولا و زمانی بەستراو بەڵام خرۆشان بوو. ڕۆژگاری ریسوایی عیسا هاتەپێش. بەشێوەیەك لەبن دیوار دادەنیشت و دەیبیست بەپاچ لێی دەدەن و تەپ و تۆزی بەسەردا دەکەن. دار لەسەقفەکە دەکەوتە خوار چوونکە لایەکی هەڵکەنرابوو، خۆڵ دەکەوتە سەر کڵا و عاباکەی. فەرمانی بەکوڕەکانی دەدا لەوێ خۆیان بەدوور بگرن. خۆی هەڵدەستا و نوێژی دەخوێند. دواتر بەهەمان شێوە فەرمانی پێدەدرا بڕواتە ژوور لەکاتێکدا جلەکانی تەپ و تۆزاوی بوو. جلەکانی نەدەتەکاند. مەنسور پێی دەوت: ئەی عیسا، کەس بەمشێوەیە نایێتە لای من چوونکە سەرتاپات تەپ و تۆزاوییە و پڕ لەخەوش و خۆڵ. ئایا ئەمە تەپ و تۆزی شەقامەکانە؟ دەیوت: ئەی سەرورەی باوەڕداران، گلەیی لەمانە ناکەم.

مەنسور، مامی، عیسای بۆ لای ئەو نارد بەڵام عیسا کوڕی موسا ئامۆژگاری وەرنەدەگرت و گومانی دەکرد ئەو لای خۆیەوە بەمشێوەیە پێشنیار دەکات. دەڵێن: مەنسور فەرمانیدا عیسا کوڕی موسا ژەهر خوارد بکەن. ئەو ئاوی ژەهراوی لەسکی خۆیدا هەست پێکرد تا بۆ کوفە بگەڕێتەوە. مەنسور فەرمانی گەڕانەوەی پێدا. عیسا بەهۆی ئەو ژەهرەوە نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ

قورستر دەبوو بەڵام دواتر (کاتێك لەلێواری مەرگ نزیك بوویەوە) باشبوویەوە.

عیسا کوڕی عەلی بەمەنسوری وت: کوڕی موسا، خەلافەتی بۆ کوڕەکەی خۆی دەوێت و ئەمە کوڕەکەی ئەوە ڕێگەی دوور خستنەوەی بۆ دەکاتەوە. پێی وت: بیترسێنە و بیتۆقێنە. عیسا کوڕی عەلی سەبارەت بەم پرسە راوێژی لەگەڵ کرد و ئەوی ترساند. موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا ترسا و ڕۆشتە لای عەباس کوڕی محەممەد و وتی: مامە، دەبینم باوکم چەندە ئازار دەکێشێت تا لەم کارە خۆی دوور بخاتەوە. بەهەموو شێوەیەکی قێزەون و نەشیاو بۆ وەسف ئازاری دەدەن. جارێك دەیترسێنێت و جارێك درەنگ فەرمانی پێدەدات، جارێك دیواری بەسەردا وێران دەکەن و جارێکی دیکە ژەهر خواردی دەکەن. باوکم گرنگی بەم کارانە نادات و ئەمە ڕاست نییە. بەڵام ڕێگەیەك هەیە و ئەگەری هەیە ئەو ڕێگە بگرێتەبەر و گەرنە بەهیچ جۆرێك ملکەچی فەرمانەکانی مەنسور نابێت. وتی: چ ڕێگەیەك؟ وتی: دەبێت سەروەری باوەڕداران پێی بڵێت و من شایەت بم: دەزانم تۆ درێغی خەلافەت لەمەهدی ناکەیت و بۆ خۆتت ناوێت چوونکە تەمەنێکت هەیە و ڕۆژگارێکی درێژ زیندوو نابیت. لەبەر ئەوە رازی نابیت دەست لەجێگری هەڵبگریت چوونکە خەلافەتت بۆ کوڕەکەی خۆت دەوێت. ئایا بەپێشنیارەکەی من رازی دەبیت تا کوڕەکەی تۆ دووای کوڕەکەی خۆم بکەمە خەلیفە؟ هەرگیز. سوێند بەخوا هەرگیز ئەم کارە سەر ناگرێت. بێ چەند و چوون هێرش دەکەمە سەر کوڕەکەت و تۆ بینەری دەبیت تا هیوا بڕاو ببیت. ئەگەر بەمشێوە بێت، ئەگەری هەیە باوکم بەمەبەستەکەی رازی بێت.

عەباس ڕۆشتە لای مەنسور و لەم وتووێژە ئاگاداری کردەوە. کاتێك لەدەوری ئەو کۆبوونەوە. ئەم بابەتەی وروژاند و عیسا کوڕی عەلی شایەتی ئەو دانیشتنە بوو. هەستا بڕواتە دەر بۆ ئەوەی دەست بەئاو بگەیێنێت. موسا کوڕی عیسا فەرمانی بەموسای کوڕیدا هەستێت عاباکەی بگرێت و بۆی کۆبکاتەوە. لەگەڵ ئەو هەستا. عیسا کوڕی عەلی پێی وت: باوکم قوربانت بێت! باوکێك بەقوربانت بێت کەتۆی هێنایە دنیا! سوێند بەخوا دەزانم لەم کارە جگە لەئێوە دووانە کەسی دیکە بوونی نییە و ئێوە کەسانێکی شیاون. بەڵام پیاو فریوداری ئەو شتە ئێوە بەپەلە

بەدووایدا دەڕۆن. موسا بەخۆی وت: ئەم پیاوە دەستی منی بۆ سەر ڕکەبەرەکەی کردەوە. سوێند بەخوا بێ چەند و چوون دەیکوژم! کاتێك ئەو دووانە گەڕانەوە، موسا بەهێواشی باوکی ئاگادار کردەوە. باوکی وتی: نفرینی لێ بێت چوونکە ئەندێشەیەکی سەرکۆنە کراو و قێزەونە. مامت بۆ نهێنییەك تۆی کردە ئەمینی خۆی و دەیسویت لای کەس نەیدرکێنیت بەڵام تۆی دەیکەیتە هۆکارێك بۆ گرفتار کردنی ئەو. هەرگیز و بەهیچ شێوەیەك نابێت کەس ئەم وتەیە لەزاری تۆ ببیستێت. بگەڕێرەوە بۆ شوێنەکەی خۆت.

کاتێك گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، مەنسور فەرمانی بەرەبیع دا، لەشوێنەکەی هەستا و رووی کردە موسا. مەبەستی ئەوەی کرد بەقایشی شمشێرەکەی بیخنکێنێت. موسا بەردەوام دەیقیژاند، خوایە، خوایە، سەبارەت بەخوێنی من ئەی سەروەری باوەڕداران! عیسا چ ترسێکی هەیە لەکوشتنی من چوونکە ئەو دە و چەند نێرینەی هەیە. مەنسور بەردەوام دەیوت: گیانی بستێنە رەبیع! رەبیع وای نیشاندەدا دەیویست بیخنکێنێت بەڵام بەشێوەیەکی نەرم سەرقاڵی کارەکەی بوو. موسا هاواری دەکرد. کاتێك باوکی ئەمەی بینی، وتی: سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران گومانم نەدەکرد کردەوەکانی تۆ بۆ وەرگرتنەوەی خەلافەت بۆ کوڕەکەت بۆ ئەم کارە قێزەوانە ناچارت بکات! دەستی لێ هەڵبگرە چوونکە بەشایەتی هەموو کەسانی ئەم دانیشتنە، پەیمان دەدەم هەموو ژنەکانم ئازاد و هەموو بەندەکانم ئازاد و هەموو سامانەکانم لەناو چووبێت ئەگەر فەرمانبەری ئەو کەسە نەبم کەتۆ دەخوازیت کاروباری خەلافەت لەسەر دەستی ئەو هەڵسوڕێنیت ئەی سەروەری باوەڕداران! ئەوە دەستی من و پەیمانی فەرمانبەری بەمەهدی دەدەم. مەهدی پەیمانی فەرمانبەری لێوەرگرت. دوای مەهدی، عیسا کوڕی موسای دیاری کرد.

یەکێك لەخەڵکانی کوفە عیسای بینی و وتی: ئەمە ئەوکەسەیە تا دوێنی بە(سبەی) ناوی دەبرا و ئەمڕۆ بە (دووبەیانی) ناوی دەبرێت.

دەڵێت: مەنسور سوپایەکی دیاریکرد و قسەی ناشیرینیان بەعیسا کوڕی موسا دەگەیاند. لەکاری ئەوان سکاڵای بردە لای یەکێك لەهاورێیان. مەنسور رێگەی ئەو

کارەی لێگرتن بەڵام دووبارە دەستیان پێدەکردەوە. دوواتر ئەو دووانە چەندین نامەیان بۆ یەك نووسی و مەنسوری تورە کرد و جارێکی دیکە سوپاکەی دەستیان بەسەرکۆنە کردنی ئەو کرد. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: ئەسەد کوڕی مەرزبان، عوقبە کوڕی سەلەم، نەسر کوڕی حەرب کوڕی عەبدوللە و کەسانی دیکە. ئەوان رێگەی ڕۆشتنە ژوورەوەیان لێدەگرت و بەقسەی ناشیرین دەیانڕازاندەوە. سکاڵای بردە لای مەنسور. پێی وت: ئەی کوڕی برام، سوێند بەخوا لەوان بۆ گیانی خۆم و تۆ دەترسم چوونکە ئەم گەنجەیان خۆش دەوێت. ئەگەر ئەو لەناو ببەیت دەست لەم کارەیان هەڵدەگرن. عیسا رازی بوو بەوشێوەیە هەڵس وکەوت بکات.

دەڵێن: مەنسور راوێژی بەخالید کوڕی بەرمەك کرد و ئەوی بۆ لای عیسا نارد. سی کەس لەگیانبەخشەکانی مەنسوری لەگەڵ خۆی برد و چەندین کەسانی لەناو ئەواندا هەڵبژارد و سەبارەت بەپەیمانی فەرمانبەری قسەی لەگەڵ عیسا کرد بەڵام رازی نەبوو و بۆلای مەنسور گەڕانەوە. شایەتییان بۆ عیسادا کەخۆی لەسەر کار لابردووە و پەیمانی فەرمانبەری بەمەهدی داوە. عیسا هات و وتەکانی ئەوانی بەناڕاست لەقەڵەمدا بەڵام رازی نەبوون. مەنسور سپاسی کارەکەی خالید کوڕی بەرمەکی کرد.

دەستەیەك دەڵێن: مەنسور خەلافەتی بەیانزە هەزار هەزار (یانزە ملیۆن) درەم لەو کڕییەوە کەتایبەت بەخۆی و منالەکانی بیت و ئەو، چەندین کەسی بۆ دەستبەردار بوونی لەخەلافەت کردە شایەت.

رۆژگاری فەرمانڕەوایی عیسا کوڕی موسا لەکوفە سیانزە ساڵ درێژەی کێشا. مەنسور ئەوی لەسەر کار لابرد و محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی وەك فەرمانداری ئەو شارە دەستنیشان کرد لەسەر ئەو بنەمایەی تا ئەو جێگەی دەتوانێت ئازاری عیسا بدات و ریسوایی بکات. بەڵام ئەو، ئەو کارەی نەکرد و بەردەوام رێزی لەعیسا دەکرد.

## مەرگی عەبدوالله کوڕی عەلی

مەنسور، دوای ئەوەی عیسا کوڕی موسای لەجێگری خەلافەت دوورخستەوە، ئەوی بانگ کرد و مامەکەی، عەبدوالله کوڕی عەلی پێسپارد تا بیکوژێت. پێی وت: خەلافەت دوای مەهدی بەتۆ دەگات، بیکوژە. ئاگادار بە سستی لەخۆت نیشان نەدەیت و ئەوکارەی پلانم بۆ داڕشتووە، لەناوی نەبەیت. دواتر بەرەو مەککە بەرێکەوت و لەنیوەی رێگە نامەی بۆ عیسا کوڕی موسا نووسی، پرسی: ئەو کارەی بەتۆم سپاردبوو، ئەنجامت دا؟ عیسا لەوەلامدا نووسی: ئەنجاممدا. مەنسور گومانی نەما کەئەوی کوشتووە.

بەلام کاتێك عیسا عەبدوالله‌ی لەمەنسور وەرگرت، دەبیرەکەی، یونس کوڕی فەروەی بانگ کرد و ئاگاداری کردەوە. یونس وتی: دەیوست ئەو بکوژیت و دواتر تۆ بەتاوانی کوشتنی ئەو بکوژێت چوونکە بەنهێنی فەرمانی بەتۆدا تا بەشێوەیەکی ئاشکرا لێپێچینەوەت لەگەڵ بکات. مەیکوژە و هەرگیز ئەو تەسلیمی مەنسور مەکە و بەزیندوویی بەلام بەنهێنی بیهێڵەرەوە. عیسا ئەو کارەی کرد.

کاتێك مەنسور گەڕایەوە، چەندین کەسی بۆ مامەکانی دانا تا بۆ نێوەنجیگەری سەبارەت بە عەبدوالله‌ی برای ناچاریان بکات. ئەو کارەیان کرد و نێوەنجیگەرییان گرتە ئەستۆ. بەنێوەنجیگەری ئەوان رازی بوو و بەعیسای وت: مامی من و مامی خۆت، عەبدوالله‌م بەتۆ سپاردبوو تا لەماڵەکەی خۆتا بێت، ئەوان نێوەنیجگەرییان کرد و رازی بووم. بیهێنە. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران مەگەر فەرمانی کوشتنی ئەوت پێنەدام؟ کوشتم. وتی: فەرمانی کوشتنی ئەوم پێنەدایت. وتی: بەڵێ، فەرمانی کوشتنی ئەوت پێدام. وتی: تەنیا فەرمانی زیندانی کردنی ئەوم پێدایت، درۆ دەکەیت! دواتر مەنسور بەمامەکانی خۆی وت: ئەمە دەستی بەکوشتنی براکەی ئێوە سوور کرد. وتیان: تەسلیمی ئێمەی بکە تا تۆڵەی لێ بستێنین. ئەوی بەوان سپارد. ئەویان بردە ناو گۆڕەپانی شار و خەڵکیان کۆکردەوە. ئەم پێشهاتە کەوتە سەر زاران. یەکێك لەوان هەستا تا بیکوژێت. عیسا وتی: دەمکوژیت؟ وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا دەتکوژم. وتی: من بۆ لای سەروەری باوەڕداران بگەڕێننەوە. ئەویان گەڕاندەوە. پێی وت: دەتویست ئەو بکوژم تا من

بکوژیت. بەڵام مامەمەکەی تۆ زیندووە. وتی: بیهێنە بۆ لای من. ئەویان هێنا. وتی: وەرە ژوور تا بزانم دەبێت چی بکەم. ئەوان بەرێکەوتن. دواتر فەرمانیدا لەماڵێکدا زیندانی بکەن کەستوونەکانی لەخوێ و ئاویان کردبوویە سەر. ماڵەکەی بەسەریدا رووخا و عەبدوالله مرد و ئەویان لەگۆڕستانی دەروازەی شام بەخاك سپارد. یەکەم کەس بوو لەو شوێنە بەخاك سپێردرا. ساڵەکانی ژیانی پەنجا و دوو ساڵ درێژەی کێشا.

دەڵێن: مەنسور ڕۆژێك سوار بوو. کوڕی عەیاشی مەنتوف هاوڕێیەتی دەکرد. مەنسور پێی وت: سێ جێگر دەناسی ناوەکەیان بە (عین) دەستی پێکردبێت و ئەوان سێ شۆڕشگێریان کوشتبێت. سەرەتای ناوەکانیان بە (عین)؟ وتی: جگە لەوەی خەڵکان باسی دەکەن، نازانم: عەلی کوڕی ئەبی تالیب عوسمان کوڕی عەفانی کوشت، عەبدمەلك عەبد رەحمان کوڕی ئەشعەسی کوشت، عەبدوالله کوڕی زوبەیر عەمرۆ کوڕی سەعیدی کوشت و عەبدوالله کوڕی عەلی ماڵێکی بەسەردا رووخا و کوژرا. مەنسور وتی: ئەگەر ماڵی بەسەردا رووخا، تاوانی من چییە؟ وتی: نەموت تۆ تاوانباریت.

(ویستبووی بڵێت عەبدوالله کوڕی عەلیت کوشت چوونکە ناوی تۆ عەبدوالله کوڕی محەممەدە.

(تێبینی):

ئەوەی وتی عەبدوالله کوڕی زوبەیر عەمرۆ کوڕی سەعیدی کوشت، راست نییە چوونکە ئەو بەدەستی عەبدمەلیك کوڕی مەروان کوژرا.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا مەنسور، محەممەد کوڕی براکەی باوکی عەباسی (خوێنخۆر)ی وەك فەرمانداری بەسرە دەستنیشان کرد. داوای بەخشینی کرد و چاوی لێ پۆشی. دواتر رووی کردە بەغداد و نوخبە کوڕی سالمی وەك جێگری خۆی دانا. مەنسور کارەکەی ئەوی پشتڕاست کردەوە و کاتێك گەیشتە شاری بەغداد، لەو شارە کۆچی دوایی کرد.

مەنسور لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزارەکانی ئەم کەسانە بوون: کارگوزاری تاییف و مەککە، مامەکەی عەبدسەمەد کوڕی عەلی، کارگوزاری مەدینە جەعفەر کوڕی سلێمان، کارگوزاری میسر یەزید کوڕی حاتەمی موهەلەبی.

لەم ساڵەدا، عەبدولرەحمانی ئومەوی فەرمانداری ئاندۆلۆس، کۆیلەکەی (بەدر) و تەمام کوڕی عەلقەمەی بۆ جەنگی تۆلدۆ لەئیسپانیا ڕەوانە کرد کەهاشم کوڕی عوزرە لەوێ بوو. ئەم دووانە بارودۆخیان لێ دژوار کرد. دواتر ئەو و حەیات کوڕی وەلیدی یەحسوبی و عوسمان کوڕی حەمزە کوڕی عوبەیدالله کوڕی عومەر کوڕی خەتابی ڕەوانە کرد. ئەم دووانە ئەوانیان بەجل و بەرگی پەشمین و سەر و روخساری تاشراو، سوار لەسەر کەر و دەست و پێی بەستراو بردە لای عەبدرەحمان. دواتر ئەوانیان لەکوردووا لەداردا.

هەروەها لەم ساڵەدا نێردراوی عەبدولرەحمان کەبۆ هێنانی کوڕە گەورەکەی سلێمان بۆ شام ڕەوانەی کردبوو، لەگەڵ سلێمان گەڕایەوە. لەئاندۆلۆس بۆ عەبدولرەحمان، کوڕەکەی هوشام چاوی بەدنیا هەڵهێنا. شازادە عەبدولرەحمان ئەوی پێش سلێمان خست و بەمشێوەیە لەنێوان ئەم دووانە کینە و ڕق هاتە ئاراوە کەدواتر ئاماژە بەدەرئەنجامەکانی دەدەین.

لەم ساڵەدا ئەستێرەکان لەئاسمانەوە کەوتنە خوار.[1]

ئەو کەسانەی لەم ساڵەدا کۆچیان کرد: ئەشعەس کوڕی عەبدمەلیکی حومرانی بەسری، هوشام کوڕی حەسان موالی لەعتیک (دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٤٨ کۆچی/ ٧٦٥ زایینی کۆچی دوایی کرد)، عەبدولرەحمان کوڕی زەبید کوڕی حارسی یامی، باوکی ئەشعەسی کوفی.

---

[1] ئەستێرەکان ناکەونە خوار. مەبەستی نووسەر بەردە ئاسمانییەکانە

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و چل و هەشتەمی کۆچی ( ٧٦٥ زایینی )

## شۆڕشی حەسان کوڕی موجالید

لەم ساڵەدا، حەسان کوڕی موجالید کوڕی یەحیا کوڕی مالك کوڕی ئەجدەعی هەمەدانی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەم مالکە، برای مەسروق کوڕی ئەجدەع بوو. شۆڕش لەناوچەکانی دەوروبەری موسڵ لەگوندێك بەناوی فەخاری نزیك موسڵ لەسەر کەنارەکانی فورات دەستی پێکرد. سوپاییەکان بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوتن و فەرماندەی ئەوان سەقر کوڕی نەجدە بوو کەدوای حەرب کوڕی عەبدوللە جێگەی ئەوی گرتبوویەوە. دوو سوپاکە ڕووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگان. سوپاکەی موسڵ شکستی خوارد و بەرەو پردەکە هەڵاتن. خواریج، هاوەڵانی حەسان، بازاری ئەو ناوچەیان سوتاند و تاڵانییان کرد.

حەسان بەرەو ڕەقە بەرێکەوت و لەوێ دەستی بەسەر دەریادا گرت و ڕووی کردە شارەکانی سند. خەواریجی عەممان، ئەوانیان دەبردە ناو شارەکە. ئەو داوای مۆڵەتی لەوان کرد تا بەرەو لای ئەوان بەرێکەوێت بەڵام ڕازی نەبوون. گەڕایەوە بۆ موسڵ و سەقر و حەسەن کوڕی ساڵح کوڕی حەسانی هەمەدانی و بیلای قەیسی بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوتن. ڕووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگیان ئەزمون کرد. سەقر شکستی خوارد و حەسەن کوڕی ساڵح و بیلال گرفتار بوون. حەسان، بیلالی کوشت بەڵام حەسەنی نەکوشت لەبەر ئەوەی لەڕەچەڵەکی خۆی یانی لەهەمەدانییەکان بوو. بەدوای ئەم کارە، دەستەیەك لەهاوەڵانی لێی جیابوونەوە.

حەسان بەهۆی خاڵۆیەوە حەفس کوڕی ئەشیم شوێن باوەڕی خەواریج کەوت. خاڵۆی لەسەر باوەڕی خەواریج بوو.

کاتێك هەواڵی کارەکانی حەسان بەمەنسور گەیشت، وتی: پیاوێکی خەواریج لەهەمەدان؟ وتیان: خوشکەزای حەفس کوڕی ئەشیمە. مەنسور وتی: لەوێ چی دەکات؟ لەبەر ئەوەی سەری سوڕمابوو چوونکە هەمەدانییەکان بەگشتی شوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون. مەنسور مەبەستی ئەوەی کرد

سوپایەك بۆ موسڵ ڕەوانە و خەڵکەکەی کوشتار و تالآن بکات. باوکی حەنیفە، کوڕی باوکی لەیلا و کوڕی شوبرومەی بانگ کرد و پێی وتن: خەڵکانی موسڵ پەیمانیان لەگەڵ من بەستووە دژی من شۆڕش نەکەن و لەبەر ئەوەی ئەو کارەیان کرد، کوشتن و تالآن کردنی سامانی ئەوان لەروانگەی ئیسلامەوە ڕەوایە. باوکی حەنیفە بێدەنگ بوو، ئەو دووانە قسەیان کرد و وتیان: خەڵکان بەگشتی لەئیمپراتۆری ئیسلامی کۆیلەی تۆن، ئەگەر بیانبەخشیت، شیاوی بۆ ئەو کارە. بەباوکی حەنیفەی وت: دەبینم بێدەنگیت هەڵبژاردووە ئەی پیرەپیاو! وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، شتێکیان بۆ تۆ ڕەوا کردووە کەسامانەکەیان نە لەدەستی ئەوان بەڵکو لەدەستی خواوەندە. بیرت لەوە کردۆتەوە ئەگەر ژنێك..... بێ پەیمانی هاوسەرگیری شەرعێك ڕەوا بکات و کەنیزیش نەبێت، ڕەوایە کەئەو.....؟ وتی: نە، بەمشێوەیە دەستی لەخەڵکانی موسڵ هەڵگرت و فەرمانی بەباوکی حەنیفە و هاورێکانیدا بۆ کوفە بگەڕێنەوە.

## هێنانە سەرکاری خالید کوڕی بەرمەك

لەمساڵەدا مەنسور خالید کوڕی بەرمەکی وەك فەرمانداری موسڵ دەستنیشان کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو ئاگاداریان کردەوە کە: کوردەکانی سەرزەمینەکەی بلاوەیان لێکردووە و ئەو ناوچەیان بەفیڕۆ داوە. پرسی: چ کەسێك دەتوانێت چارەسەری ئەم کێشە گەورەیە بکات؟ وتیان: موسەییب کوڕی زوهەیر. عەمارە کوڕی عەمرە وتی: کاتێك کارێکی گران دێتە پێش، پیاوێکی وەك خالیدی بەرمەکی پێویستە. مەنسور ئەوی راسپارد و ڕەوانەی ئەو ناوچەیەی کرد. خالید بەرێکەوت و ڕێگەی چاکەکاری لەگەڵ خەڵکەکەی گرتەبەر و خراپەکارانی سەرکوت کرد و ڕێگەی کارە نەشیاوەکانی لێگرتن. خەڵکی شارەکە بەتەواوی لێی دەترسان هەرچەند چاکەی لەگەڵ کردبوون.

لەمساڵەدا، حەوت ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی زی حەججە/٩ فەوریەی ٧٦٦ زایینی، فەزڵ کوڕی یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك چاوی بەدنیا هەڵهێنا. بەدنیا هاتنی

ئەو حەوت ڕۆژ پێش بەدنیا هاتنی ڕەشید کوڕی مەهدی بوو. خەیزەران دایکی ڕەشید ئەوی بەشیری کوڕەکەی پەروەردە کرد و لەبەر ئەمە بەفەزڵ کوڕی یەحیا (برای شیری) هارون ناوی دەرکرد. هۆنراوەی سەلام کوڕی خاسر لێرەوە سەرچاوە دەگرێت:

اصبح الفضل و الخليفة هارو    ن رضيعى لبان خير النساء

واتاکەی: فەزڵ و خەلیفە (ڕەشید) هەردووکیان بوونە هاوشیری باشترین ژنانی جیهان.

باوکی جونوب ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

كفى لك فضلا ان افضل حرة    غذتك بثدى و الخليفة واحد

واتاکەی: ئەم لەپێشییە بۆ تۆ بەسە کەباشترین ژنە ئازادەکان، تۆ و خەلیفەی، لەیەك مەمك شیردا.

## فەرمانداری ئەغلەب کوڕی سالم لەئەفریقییە

کاتێك مەنسور ئاگادار بوویەوە محەممەد کوڕی ئەشعەس لەئەفریقییە ئالای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە، نامەیەکی بۆ ئەغلەب کوڕی سالم کوڕی عەقال خەفاجەی تەمیمی نووسی و وەك فەرمانداری ئەفریقییە دەستنیشانی کرد. ئەغلەب ئەو کەسەیە لەگەڵ ئەبو موسلیمی خوراسانی، ڕێبەڕایەتی شۆڕشی سەراسەری جیهانی ئیسلامی لەدەست گرت و لەگەڵ محەممەد کوڕی ئەشعەس ڕووی لەئەفریقییە کرد. کاتێك فەرمانی فەرمانداری بەدەست گەیشت (لەجومادی دووەمی ١٤٨ کۆچی/ ژوئیەی ٧٦٥ زایینی) ژمارەیەك لەفەرماندە سوپاییەکانی لەخەڵکانی موزێر لەسەر کار لابرد و بەمشێوەیە خەڵکانی هێوەر کردووە.

دواتر باوکی قوڕە لەگەڵ دەستەیەکی زۆر لەبەربەرییەکان ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەغلەب بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و باوکی قوڕە بێ جەنگ و دەرگیری، ڕەوانەی تانژە بوو. ئەم کارە بۆ سوپاییەکان دژوار بوو لەبەر ئەمە یەك یەك، بەسیلاحەوە لەناو سوپاکەی هاتنەدەر و ڕوویان لەکایروان (قەیرەوان) کرد. تەنیا چەند کەسێکی لەگەڵدا مایەوە.

لەم ناوەدا حەسەن کوڕی حەربی کێندی لەشاری تونس بوو. ئەو نامەی بۆ

سوپاییەکان نووسی و پێشنیاری فەرمانبەری کردنی خۆی پێدان. ئەوان بەداواکەی رازی بوون. بەرێکەوت و بێ هیچ رێگرێك ڕۆشتە ناو قەیرەوان.

ئەم هەواڵە بەئەغلەب گەیشت و جارێکی دیکە گەڕایەوە. یەکێك لەهاوەڵانی پێی وت: کارێکی راست نییە بەم دەستە کەمە رووبەرووی دوژمن ببیتەوە. باشترە روو بکەیتە کابس (قابس) تا زۆربەی ئەو کەسانەی شوێنکەوتەی تۆن، پەیوەستت بن چوونکە ئەوان ڕۆشتن بۆ تانژەیان (تەنجە) پەسەند نەکرد. بەوان هێز وەردەگرێت و شەڕ لەگەڵ دوژمنەکەت دەکەیت. ئەو کارەی کرد و ژمارەی سوپاکەی فراوان بوو. بۆ شەڕی حەسەن کوڕی حەرب بەرێکەوت و جەنگ دەستی پێکرد. حەسەن شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی کوژران. حەسەن ڕۆشتە تونس. ڕۆشتنی ئەو لەجومادی دووەمی ساڵی ١٥٠ کۆچی/ ژوئیەی٧٦٧ زایینی بوو. زۆربەیان روویان لەکایراوان (قەیرەوان) کرد.

حەسەن و دەستەیەك کۆبوونەوە و سوپایەکی گەورەیان پێکهێنا. ئەو مەبەستی ئەغلەبی کرد و ئەغلەب لەکایروانەوە بەرێکەوت. رووبەرووی یەك بوونەوە و کوشتار دەستی پێکرد. تیرێك بەر ئەغلەب کەوت و مرد. هاوالأنی خۆڕاگرییان کردە پیشە و موخاریق کوڕی غەفار سەرکردایەتی ئەوانی گرتەدەست و هێرشی کردە سەر حەسەن. ئەو پێشتر فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی ئەغلەب بوو. حەسەنی شکستدا و ئەو تێکشکاو، لەشەعبانی ١٥٠ کۆچی/ سێپتامبەری ٧٦٧ زایینی هەڵاتوو پاشەکشێی کرد و موخاریق لەمانگی رەمەزان/ ئۆکتۆبەری ٧٦٧ زایینی فەرمانداری ئەفریقییەی گرتەدەست و سوپایەکی بۆ شوێنکەوتنی حەسەن ڕەوانە کرد. حەسەن لەتونسەوە بەرەو کەتامە هەڵات و بۆ ماوەی دوو مانگ لەوێ مایەوە. دواتر بۆ تونس گەڕایەوە وسوپای ئەو سەرزەمینە شەڕیان لەگەڵ کرد و کوشتیان.

دەڵێن: حەسەن دوای ئەغلەب کوژرا چوونکە هاوەڵانی ئەغلەب دوای کوژرانی ئەو خۆڕاگرییان کرد و لەگۆڕەپانی جەنگ پیاوانە تێکۆشان. حەسەن کوڕی حەربیش کوژرا و هاوەڵانی هەڵاتن. حەسەنیان لەداردا و ئەغلەبیان بەخاك سپاردو بەگیان باز ناویان برد. ئەم روداوە لەشەعبانی ١٥٠ کۆچی/ سێپتامبەری ٧٦٧ زایینی روویدا.

## ئاژاوەکانی ئاندۆلۆس

لەم ساڵە، سەعیدی یەحسوبی ناسراو بەنازناوی مەتەری لەئاندۆلۆس لەشاری لەبلە شۆڕشی کرد.

هۆکاری شۆڕشەکەی ئەوە بوو: ڕۆژێك شەرابی خواردەوە و سەرخۆش بوو. کەوتە بیری هاوەڵانی کە لەگەڵ عەلا کوژرابوون. پێشتر چۆنیەتی کوژرانی ئەوانمان باس کرد. ئاڵایەکی بەست و کاتێك هاتە هۆش خۆی، ئاڵایەکی هەڵکراوی بینی، کاتێك مەبەستی داگرتنی ئاڵاکەی کرد ((چونکە پرسی بووی بۆ ئاڵاکەی هەڵکردووە و هۆکارەکەیان پێوتبوو)) وتی: ئایا ئەو کەسەم ئاڵایەك هەڵبکەم و بیّ هۆ بیکەمەوە. شۆڕشی دەستپێکرد و یەمانییەکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو مەبەستی سیوەیلی کرد ودەستی بەسەردا گرت. ژمارەی شوێنکەوتەکانی بەردەوام فراوان دەبوو. عەبدولرەحمان فەرمانداری ئاندۆلۆس، لەگەڵ سوپاکەی بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و مەتەری لەرۆژی یانزەی ڕەبیعی یەکەم/٧ مەی ٧٦٥ زایینی لەقەڵای زاواگ (زەعواق) سەنگەری گرت و عەبدولرەحمان گەمارۆی خستەسەر و بارودۆخی لیّ دژوار کرد بەڵام نەیارەکان ڕێگەی گەیشتن بەویان لێگرت.

غیاس کوڕی عەلقەمەی لەخمی لەشاری شەزونە بۆ هاوکاری کردنی شۆڕشەکەی بەڵێنی پێدابوو. دەستەیەك لەپیرانی هۆزەکان پەیوەستی بووون. ژمارەیان زۆر و هەنووکە چاوەڕوانی هاوکاری مەتەرییان دەکرد.

کاتێك عەبدولرەحمان لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە، کۆیلەکەی (بەدر) لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەوان نارد تا ڕێگەی گەیشتنی ئەوان بەمەتەری بگرێت. گەمارۆکە درێژەی کێشا و هاوەڵانی ئەو لەبەر کوشت و کوشتار کەم بوونەوە لەبەر ئەمە، دەستەیەك لەخەڵکان لەدەوری بڵاوەیان لێکرد. ئەو، ڕۆژێك لەقەڵاکە هاتەدەر و جەنگا و کوژرا. سەری ئەویان وەك دیاری بۆ عەبدولرەحمان برد.

کەسانی ناو قەڵاکە، خەلیفە کوڕی مەروانیان وەك پێشەوای خۆیان هەڵبژارد. گەمارۆ بەردەوام بوو. پەیك و پەیامیان نارد و داوای ئەمانیان لە عەبدولرەحمان کرد لەسەر ئەو بنەمایەی خەلیفەی ڕادەست بکەن. عەبدولرەحمان

بەپێشنیارەکەیان رازی بوو لەسەر ئەو بنەمایەی هەم خەلیفە و هەم قەلاًکەی تەسلیم بکەم. قەلاًکەی وێران کرد و خەلیفە و کەسانی ناو قەلاً و هاوەلاًنی خەلیفەی کوشتار کرد. دواتر بەمەبەستی جەنگ لەگەڵ غیاسی هاوپەیمانی مەتەری بەرێکەوت. گەمارۆی خستە سەریان و بازنەی گەمارۆکەی تەسك کردەوە. داوای ئەمانیان کرد و ئەمانی پێبەخشین جگە لەچەند کەس چوونکە دەیزانی دوژمنی فەرمانڕەوایی عەرەبەکانن. ئەوانی گرت و بۆ کوردوا گەڕایەوە. کاتێك گەڕایەوە، عەبدوڵلە کوڕی خوراشەی ئەسەدی لەشاری ژیان (جیان) دژی ئەو ئالاًی شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستەیەك دەوریان گرت. ئەو هێرشی کردە سەر کوردوا و عەبدولرەحمان سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو نارد. عەبدوڵلە داوای ئەمانی کرد و عەبدولرەحمان پێی بەخشی و رێزی لەئەمانەکەی خۆی گرت.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەمساڵەدا ساڵح کوڕی عەلی لەدابق ئوردووی لێدا بەلاًم جەنگی نەکرد.

ئەبوجەعفەری مەنسور لەم ساڵ رێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

فەرمانداری شارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: سلێمان کوڕی مێرهانی نابینا، لەدایك بووی ساڵی ٦٠ کۆچی/٦٨٠ زایینی، جەعفەر کوڕی محەممەدی سادق (پێشەوای شەشەمی شیعەکان، گۆڕەکەی لەمەدینەیە و خەڵکان سەردانی دەکەن. ئەو و باوکی و باوەگەورێی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەیەك ئارامگادان، زەکەریا کوڕی باوکی زاید، باوکی ئومەییە عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی یەعقوب، موالی قەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادە کەدەستەیەك دەڵێن لەساڵی ٩٠ کۆچی/ ٧٠٩ زایینی مرد، عەبدوڵلە کوڕی یەزید موالی ئەسوەد کوڕی سوفیان یا موالی تەمیم، محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی باوکی لەیلای داوەر، محەممەد کوڕی وەلیدی زەبیدی، محەممەد کوڕی عیجلانی مەدەنی، عەوام کوڕی حەوەشب کوڕی یەزید کوڕی رەوەیمی شەیبانی واستی؛ یەحیا کوڕی باوکی عەمودی سیبانی لەخەڵکانی رەملەی فەلەستین.

## ڕووداوەكانی ساڵی سەد و چل و نۆی كۆچی( ٧٦٦ زایینی )

لەم ساڵەدا عەباس كوڕی محەممەد بەمەبەستی جەنگی هاوینە ڕۆشتە ناو سەرزەمینی رۆم و حەسەن كوڕی قەحتەبە و محەممەد كوڕی ئەشعەس هاوڕێیەتیان دەكرد. محەممەد لەڕێگەدا مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا، مەنسور كۆتایی بەدروست كردنی شاری بەغداد هێنا و دیوارەكانی بەرز كردەوە و لەهەموو كارەكان تەواو بوو. دواتر بەرەو حەدیسەی موسڵ بەرێكەوت و گەڕایەوە.

محەممەد كوڕی ئیبراهیم كوڕی محەممەد كوڕی عەلی كوڕی عەبدوالله كوڕی عەباس ریێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا.

عەبدسەمەد كوڕی عەلی لەم ساڵەدا لەفەرمانداری مەككە دوورخرایەوە (وتەی دەستەیەك لەمێژوو نووسانە) و محەممەد كوڕی ئیبراهیم لەجێگەی ئەو هاتە سەر كار. كارگوزارانی شارەكان هەمان كەسانی ساڵەكانی پێش بوون جگە لەكارگوزارانی مەككە و تاییف.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان فەرمانداری ئاندۆلۆس، موالییەكی خۆی یانی بەدری بۆ سەرزەمینی دوژمنان نارد. بەدر ڕۆشت و باج و خەراجی كۆكردەوە. باوكی سەباحی حەی كوڕی یەحیا فەرمانداری سیوەیل بوو و خەڵكەكەی بۆ شۆڕش هاندا. عەبدولرەحمان كەسی بۆ لای ئەو ڕەوانە كرد و فریویدا. هاتە لای عەبدولرەحمان و كوشتی.

ئەم كەسانە لەم ساڵەدا مردن: سەلم كوڕی قوتەیبەی باهلی دەری كەكەسێكی ناودار و ڕێزدار بوو. كەهمس كوڕی حەسەن كوڕی باوكی حەسەنی تەمیمی بەسری، عیسا كوڕی عومەری سەقەفی شارەزای ڕێزمانی عەرەبی كەكەسێكی بەناوبانگ بوو. خەلیل ڕێزمانی عەرەبی لەو فێر بوو. ئەو، لەمبارەوە كتێبێكی هەیە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجای کۆچی ( ٧٦٧ زایینی )

لەم ساڵەدا ئوستاد سیس لەنێوان خەڵکانی هەرات و بادغەیس و سیستان و شوێنەکانی دیکە لەشارەکانی خوراسان لەبەرابەر فەرمانڕەوایی ئەنیران لەئێران ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو پێشتر، سێسەد هەزار شەڕکەری لەژێر دەستا بوو. ئەوان سەراسەری خوراسانیان هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. بەرێکەوتن و ڕووبەڕووی خەڵکانی مەروروود بوونەوە. ئەجشەمی مەرورووودی لەگەڵ خەڵکانی ئەو سەرزەمینە ڕووبەڕوویان بوونەوە. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و ئەجشەم کوژرا و ژمارەی کوژراوانی سوپاکەی ڕووی لەزیاد بوون کرد. دەستەیەك لەفەرماندەکان هەڵاتن، لەناویان ئەم کەسانە دەبینران: مەعاز کوڕی موسلیم، جیبرائیل کوڕی یەحیا، حیماد کوڕی عەمرۆ، بونجەمی سیستانی و داوود کوڕی کەڕار.

مەنسور کە لەم کاتەدا لەرازان ژیانی بەسەر دەبرد، خازم کوڕی خوزەیمەی بۆ لای مەهدی نارد و مەهدی، کاروباری جەنگ دژی ئوستاد سیسی بەو سپارد و ئەوی وەك فەرماندە دەستنیشان کرد. خازم بەرێکەوت و تێکشکاوەکانی کۆکردەوە و سوپایەکی گەورەی ڕازاندەوە. بیست و دوو هەزار جەنگاوەر هاوڕێیەتیان دەکرد. شەش هەزار جەنگاوەری لەنێوان تێکشکاوەکان هەڵبژارد. بەکار کوڕی سەلەم یەکێك بوو لەوان. ئەو سوپاکەی خۆی ئامادە دەکرد. هەیسەم کوڕی شوعبەی وەك فەرماندەی باڵی ڕاست و نەهار کوڕی حوسەینی سەعدی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دیاریکرد. بەکار کوڕی سەلەمی عوقەیلی وەك فەرماندەی پێشەنگەکان دانا. ئاڵاکەی لەدەستی زەبریقاندا بوو.

فریوی بەکار برد بەوشێوەی ئەوانی لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دیکە دەبرد تا بڵاوەیان پێ بکات. زۆرینەی ئەوان لەپیادەکان پێك دەهاتن. دواتر خازم ڕۆشتە شوێنێك و بۆ خۆی و سوپاکەی سەنگەری هەڵکەند و چوار ڕێگەی چوونە دەرەوەی بۆ دانا. لەسەر هەر ڕێگەیەك هەزار کەس لەجەنگاوەرە هەڵبژێردراوەکانی

خۆی جێگیر کرد. ئوستاد سیس و سوپاکەی هاتن. پاچ و تەور و خاکەناز و تەناف و زنجیریان پێبوو تا سەنگەرەکان پڕ بکەنەوە. لەدەروازەیەکەوە هاتنە ناو سەنگەرەکە کەبەکار کوڕی سەلەم لەوێ جێگیر کرابوو. بەشێوەیەك هێرشیان کردە سەر هاوەڵانی بەکار کەشکستیان خوارد. بەکار لەچوارپێکەی هاتەخوار و لەدەروازەی سەنگەرەکە وەستا و بەهاوەڵانی وت: لەشوێنەکەی ئێمەوە ناتوانن هێرش بکەنە سەر موسوڵمانان. لەخزم و کەسە نزیکەکانی نزیکەی پەنجا کەس لەچوارپێکانیان دابەزین و شەڕیان لەگەڵ ئەوان ئەزموون کرد تا ئەوەی جەنگاوەرانی ئوستاد سیسی لەدەروازەکە دوور کردەوە. دواتر یەکێك لەفەرماندەکانی ئوستاد سیس هێرشی کردە سەر ئەو دەروازەی خازم لەوێ بوو. ئەو کەسە پیاوێکی سیستانی بوو بەناوی حەریز. ئەو بوو کارەکانی سامان دەدا. کاتێك خازم هێرشەکەی ئەوی بینی، کەسی بۆ لای هەیسەم کوڕی شوعبە فەرماندەی باڵی راست نارد. فەرمانی پێدا لەو دەروازەوە بێت کەبەکار فەرماندە بوو چوونکە ئەو کەسانەی رووبەرووی ئەو بوونەتەوە، سەرقاڵی کێشەیەکی دیکەن. بەشێوەیەکی نهێنی بەرێکەوێت و لەپشتەوە هێرش بکاتە سەر دوژمن. ئەوان چاوەڕوانی هاتنی باوکی عەون و عەمرۆ کوڕی سەلەم کوڕی قوتەیبەیان لەتەخارستانەوە دەکرد.

خازم کەسی بۆ لای بەکار نارد و پەیامیدا: کاتێك ئاڵاکەی هەیسەمتان بینی، دەنگی تەکبیر بەرز بکەنەوە و هاوار بکەن: تەخارستانییەکان هاتن. هەیسەم ئەو کارەی کرد. خازم لەناوەڕاستی سوپاکەی هاتەدەر و ئەوانی گرفتاری جەنگەکە کرد و جەنگاوەران خۆراگرییان کردەپیشە.

لەو کاتەی سەرقاڵی جەنگ بوون لەناکاو سەیریان کرد و ئاڵاکانی هەیسەمیان بینی و لەناو خۆیاندا هاواریان کرد: تەخارستانییەکان هاتن. کاتێك سەیری ئەوانیان کرد، هاوەڵانی خازم هێرشیان کردنەسەر و بڵاوەیان پێکردن. شەڕکەرانی هەیسەم ئەوانیان بینی و سینەیانیان کردە ئاماجی ڕمەکانی خۆیان و بەزوبینەکان قوڕگیان بڕین.

لەم کاتەدا نەهار کوڕی حوسەین لەباڵی چەپ و بەکار کوڕی سەلەم و

شەڕکەرانی باڵی ڕاست هێرشیان کردنەسەر و شکستیان پێهێنان و شمشێریان خستە ناو ئەوان. ژمارەیەکی زۆریان کوشت. ژمارەی کوژراوەکانیان بەحەفتا هەزار کەس خەملاند و چواردەهەزار کەس گرفتار بوون. ئوستاد سیس و دەستەیەکی کەم ڕزگاریان بوو و ڕوویان کردە کوێستانەکان. خازم گەمارۆی خستنە سەر و هەر چواردەهەزار ئەسیرەکەی سەربڕی. باوکی عەون و عەمرۆ کوڕی سەلەم و هاوەڵانیان بۆ هاوکاری ئەوان هاتن و ئوستاد سیس لەسەر فەرمانی حەکەم کوڕی باوکی عەدەن هاتەخوار. حەکەم فەرمانیدا ئوستاد سیس و کەسانی بنەماڵەکەی بەزنجیر و بەندی ئاسنین ببستنەوە و کەسانی دیکە ئازاد بکەن. ئەوان سی هەزار پیاوی شەڕکەر بوون. خازم بەڵێنەکانی خۆی هێنایەدی و هەر پیاوێك دوو دەستە جل و بەرگی پێ بەخشی و هەواڵی ئەم کارەی بۆ مەهدی نووسی. مەهدیش نامەکەی بۆ مەنسور ڕەوانە کرد.

دەڵێن: شۆڕشی ئوستاد سیس لەساڵی ١٥٠ کۆچی/٧٦٧ زایینی و شکستی ئەو لەساڵی ١٥١ کۆچی/٧٦٨ زایینی ڕوویدا.

هەروەها دەڵێن: ئوستاد سیس خۆی وەك پێغەمبەر دەناساند و هاوەڵانی دەستیان بۆ کارە قێزەونەکان درێژ کرد و ڕێگرتن و چەتەیی بوو بەپیشەیان.

دەستەیەك دەڵێن: ئەو باوەگەوڕێ مەئمون، باوکی دایکی، مەراجیل بوو و کوڕەکەی غالیب خاڵی مەئمون بوو. ئەو بوو بەهاوکاری مەئمون (ذوریاستین) فەزل کوڕی سەهلی کوشت کەدواتر بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەنسور، جەعفەر کوڕی سلێمانی لەفەرمانداری مەدینە دوور خستەوە و حەسەن کوڕی زەید کوڕی حەسەن کوڕی عەلی لەجێگەی ئەو دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا غەیاس کوڕی مەسیری ئەسەدی لەئاندۆلۆس لەنایچە ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە. فەرماندەکان سوپایەکی گەورەیان بۆ عەبدولرەحمان کۆکردەوە ئەو بۆ جەنگی غەیاس بەرێکەوت و شەڕی لەگەڵ کرد. غەیاس شگستی

خوارد و هاوەڵانی ڕایان کرد. غەیاس کوژرا و سەری ئەویان بۆ لای عەبدولرەحمان لەکوردوا برد.

عەبدسەمەد کوڕی عەلی لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەمە گێڕانەوەیەکی یەکێك لەمێژوو نووسانە. کەسانی دیکە دەڵێن: فەرماندار محەممەد کوڕی ئیبراهیم بوو. فەرمانداری کوفە سلێمان کوڕی عەلی بوو، فەرمانداری بەسرە عوقبە کوڕی سەلەم. سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە سوار و فەرمانداری میسر یەزید کوڕی حاتەم بوو.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: جەعفەر کوڕی باوکی جەعفەری مەنسور کەباوکی نوێژی لەسەر خوێند و لەشەودا لەگۆڕستانی قورەیش بەخاکی سپارد. خەڵك لەم ساڵەدا جەنگی هاوینەیان نەکرد. ڕێبەری گەورە باوکی حەنیفە نەعمان کوڕی سابت، مەعمەر کوڕی شەداد، عەمرۆ کوڕی زوڕ کەدەڵێن: لەساڵی ١٥٥ کۆچی/ ٧٧٢ زاییینی کۆچی دووایی کرد. یەکێك بوو لەچاکەکاران و شوێنکەوتەی باوەڕی مەرجییەکان بوو. عەبدولمەلیك کوڕی عەبدعەزیز کوڕی جورەیج، محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی یەسار فەرماندەی چەندین شەڕ، موقاتیل کوڕی سلێمانی بەڵخی، شارەزای تەفسیر کە لەگێڕانەوەی وتەکانی پێغەمبەر (د.خ) بەسست و لاواز لەقەڵەم دەدرا، باوکی جەنابی کەلبی، عوسمان کوڕی ئەسوەد، سەعید کوڕی باوکی عروبە، ناوی باوکی، باوکی عروبە میهران موالی مناڵەکانی یەشکور و نازناوەکەی باوکی نەزر بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و یەکی کۆچی ( ٧٦٨ زایینی )

## لەم ساڵەدا خەڵکانی کورك نەژاد ( تورك نەژاد ) هێرشیان کردە سەر جەدە.

## لەسەر کار لابردنی عەمرۆ کوڕی حەفس لەفەرمانداری سند

## دانانی هوشام کوڕی عەمرۆ

لەمساڵەدا مەنسور، عومەر کوڕی حەفس کوڕی عوسمان کوڕی قەبیسە کوڕی باوکی سەفرە، ناسراو بەهەزار پیاوی لەفەرمانداری سند لابرد و هوشام کوڕی عەمرۆ تەغلەبی لەو سەرزەمینە دانا و عومەر کوڕی حەفسی وەك فەرمانداری ئەفریقییە دەستنیشان کرد.

هۆکاری لەسەر کالابردنەکەی ئەوە بوو: کاتێك محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن و براکەی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن، شۆڕشەکەی خۆیان دەستپێکرد، عومەر کوڕی حەفس فەرمانداری ئەفریقییە بوو. محەممەد کوڕی عەبدوالله ناسراو بەناوی ئەشتەری بۆ بەسرە ڕەوانە کرد. ئەو، لەوێ چەندین ئەسپی ڕەسەنی کڕی تا لەکاتی پێویست بتوانێت بیانگەیێنێتە دەست عەمرۆ کوڕی حەفس چوونکە یەکێك بوو لەفەرماندەکانی سوپاکەی مەنسور کە پەیمانی فەمانبەری لەگەڵ محەممەد بەستبوو. ئەو، شوێنکەوتە بوو. ئەوان لەڕێگەی دەریاوە بەرەو سەند بەرێکەوتن و عومەر فەرمانی پێدان ئەسپەکانی خۆیان بێنن. یەك لەوان وتی: دیارییەکی گرانبایترمان لەئەسپە ڕەسەنەکان بۆ تۆ هێناوە کەبەختەوەری ئەم دنیا و ئەو دنیای بەدواوە دێت. ئەمانمان بدە تا بەسەرهاتەکەت بۆ بگێڕینەوە. یا ڕازی دەبیت ودەبیتە یەکێك لەئێمە یا ئەوەی ئەم نهێنیە ئاشکرا ناکەیت وئازارمان نادەیت تا لەولاتەکەی تۆ بەندروستی دەگەڕێینەوە. عومەر کوڕی حەفس ئەمانی پێ بەخشی.

ئەو چۆنیەتی کاری خۆی و کاری عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوالله‌ی باس کرد کەباوکی ئەوی بۆ لای ئەو ڕەوانە کردووە. عومەر کوڕی حەفس بەخێرهێنانی کردن و پەیمانی فەرمانبەری لەگەڵ بەست و ئەشتەری لەشوێنێك

دوورتر لەخۆی نیشتەجێ کرد. پێشنیاری فەرمانبەری ئەوانی بەگەورەی شارەکان و سەرکردەی سوپاکان کرد و رازی بوون. ئالای سپی دروست و ئامادە کرد تا بەو ئالایانە وتار پێشکەشی خەڵکان بکات. رۆژی پێنج شەممە، خۆی بۆ ئەم کارانە ئامادە کرد. لەم کاتەدا پەیکێك لەگەڵ نێردراوێك لەهاوسەری عومەر کوڕی حەفس گەیشتە لای کە لەکوژرانی محەممەد کوڕی عەبدوالله ئاگاداری دەکردەوە. ڕۆشتە لای ئەشتەر و ئاگاداری کردەوە و دڵنەوایی کرد. ئەشتەر وتی: کارەکەی من ئاشکرا بووە و خوێنی من لەئەستۆی تۆدایە. عومەر وتی: ئەندێشەیەکی شیاوی پەسەندم هەیە: لێرە پاشایەك لەپاشاکانی سند دەژی، خاوەن شکۆیە و ولاتێکی بەرینی لەژێر دەستایە لەگەڵ هێزێکی فراوان و ڕێزێکی بێ کۆتایی بۆ دوواهەمینی پێغەمبەران، ئەمەکدار بەپەیمان و بەڵێن تا دوا دڵۆپی خوێن. پەیوەندی خۆت لەگەڵ ئەو بەهێز بکە چوونکە تۆ بۆ لای ئەو دەنێرم. لەوێ کەس دەستی بەتۆ ناگات. ئەو کارەی کرد و ئەشتەر بۆ لای پاشا بەرێکەوت. پاشا ڕێزی لێگرت و چاکەکاری خۆی ئاشکار کرد. زەیدییەکان بەشێوەیەکی نهێنی دەڕۆشتنە لای تا ئەوەی ژمارەیان بوو بەچوارسەد کەس لەزانایان و شارەزایان. لەگەڵ ئەوان سەردەکەوت و بەساز و بەرگی شایانە دەڕۆشتە ڕاو.

کاتێك مەنسور لەم کارە ئاگادار بوویەوە، تورە بوو. نامەی بۆ عومەر کوڕی حەفس نووسی و لەو پێشهاتە ئاگاداری کردەوە. نامەی بۆ خەڵکان خوێندەوە و پێی وتن: ئەگەر فەرمانەکانی جێبەجێ نەکەم، لەسەر کار لامدەبات، ئەگەر بڕۆمە لای، دەمکوژێت و ئەگەر نەیاری بم، بۆ شەڕی من دێت. پیاوێك وتی: گوناحەکە بخە ئەستۆی من، بمگرە و زیندانیم بکە. ئەو نامەت بۆ دەنێرێت تا من ڕەوانە بکەیت. من ڕەوانە بکە و دڵنیابە هیچ بەڵایەك بەسەر مندا ناهێنێت چوونکە پێگەی تۆ لەسند و شکۆی بنەماڵەکت لەبەسرە دەزانێت. عومەر وتی: بۆچوونێکی پێچەوانەی بۆچوونەکەی تۆم هەیە. وتی: ئەگەر کوژرام، قوربانی خۆت بێت.

ئەوی گرت و زیندانی کرد. داستان و چۆنیەتی کارەکەی بۆ مەنسور نووسی. مەنسور فەرمانیدا ڕەوانەی بکات. کاتێك گەیشتە لای مەنسور، سەری بڕی.

دواتر هوشام کوڕی عەمرۆ تەغلەبی وەك فەرمانڕەوای سند دەستنیشان کرد.

هۆکاری دەستنیشان کردنی ئەوە بوو مەنسور نەیدەزانی چ کەسێك وەك فەرمانداری سند دیاری بکات. رۆژێك هوشام سەرکەوت و مەنسور سەیری دەکرد. کتاوپڕ لەبەرچاو نەما و خێرا گەڕایەوە. بۆ ڕۆشتنە لای مەنسور داوای مۆڵەتی کرد. مۆڵەتی پێدرا و ڕۆشتە ناو، وتی: کاتێك لەگەڵ هاورێیان ڕۆشتینەدەر، چاوم بەفلأنە خوشکم کەوت. بەرادەیەك جوان هاتە بەرچاوم کەتەنیا شیاوە ببێتە هاوسەری باوەڕداران. مەنسور بیری کردەوە و سەری داخست، وتی: بڕۆدەر تا فەرمانەکەم بەتۆ بگات. کاتێك ڕۆشتەدەر، مەنسور بەدەرگاوانەکەی خۆی یانی رەبیعی وت: هۆنراوەیەکی جەریرم لەبیرە بەمشێوەیە:

لا تطلبن خؤلة فى تغلب فالزنج اكرم منهم اخوالا

واتاکەی: هەرگیز بەهیچ شێوەیەك، خالۆ لەڕەچەڵەکی تەغلەبییەکان هەڵمەبژێرە چوونکە ڕەشتەکان وەك خالۆ، لەوان ڕێزدارترن.

ئەگەر ئەمەم نەدەزانی خوشکەکەیم دەکردە هاوسەری خۆم. پێی بڵێ: ئەگەر پێویستم بەهاوسەرگیری دەبوو بەپێشنیارەکەت رازی دەبووم. خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە، تۆم وەك فەرمانداری سند دەستنیشان کرد.

هوشام بەرەو سند بەرێکەوت و پاشایەتی ئەو سەرزەمینەی گرتەدەست. عومەر کوڕی حەفس ڕۆشتە ئەفریقییە و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. کاتێك هوشام گەیشتە سند، گرتن و زیندانی کردنی ئەشتەری پەسەند نەکرد و لەبەر چاوی خەڵکان وای نیشاندا لەگەڵ ئەو پاشایە بەردەوام نامە دەگۆڕێتەوە. هەواڵی ئەم کارانە بەمەنسور گەیشت. دەستی بەنامە نووسین کرد و بەردەوام هانی دەدا. لەو کاتەی سەرقاڵی ئەم کارە بوو لەناکاو پیاوێکی شۆڕشگێر لەیەکێك لەشارەکانی سند ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە. هوشام سەفنەجی برای ڕەوانە کرد. سەفنەج لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرێکەوت و رێگەی گەیشتن بەشوێنەی مانەوەی ئەو پاشایەی گرتەبەر. بەهەمان شێوە کە لەرێگە بەردەوام بوو، تەپ و تۆزێك لەرێگە بەرز بوویەوە. گومانی کرد پێشەنگی سوپای دوژمنە و مەبەستی هێرش کردنیان هەیە. پێشەنگەکانی خۆی ڕەوانە کرد و بەرەو تەپ و تۆزەکە بەرێکەوتن. بینیان و وتیان: ئەوە عەبدوالله کوڕی محەممەدی عەلەوییە کە بۆ گەڕان هاتووە بۆ

کەنارەکانی میهران. مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام چاکەخوازان پێیان وت: ئەمە کوڕی پێغەمبەری خوایە و براکەی ئەوی ئازاد کردووە نەکا گرفتاری خوێنی ئەو ببێت. ئەو، لەمەبەستەکەی پاشگەز بوویەوە بەڵام وتی: دەستم لەگرتنی ئەو هەڵنەدەگرت و ڕێگەم نەدەدا کەسێکی دیکە ئەو بگرێت و لەم ڕێگەوە یا لەڕێگەی کوشتنی ئەو، لای مەنسور پێگەی پێ ببڕێت. عەبدوالله لەگەڵ دەکەس بوو. مەبەستی ئەوی کرد و عەبدوالله جەنگی دەست پێکرد و لەگەڵ هاوەڵانی ئەو جەنگا تا ئەوەی کوژرا. کەس ڕزگاری نەبوو، عەبدوالله کەوتە ناو کوژراوە و نەیتوانی عەبدوالله بگرێت.

دەڵێن: هاورێکانی ئەویان خستە میهرانەوە تا سەری نەبڕدرێت و ڕەوانەی مەنسور نەکرێت. هوشام بەسەرهاتەکەی بۆ مەنسور نووسی و ئەو وەڵامی دایەوە. سپاسی کرد و فەرمانی جەنگ دژی ئەو پاشای پێدا. فەرمانەکەی بەکار برد و جەنگی دژی پاشا دەستپێکرد تا ئەوەی شکستی پێهێنا و لەجێگەکەی دانیشت و دەستی بەسەر وڵاتەکەیدا گرت.

عەبدوالله چەندین کەنیزی مانگ ڕوخساری بۆ خۆی دیاریکردبوو. یەکێك لەوان کوڕێکی هێنایە دنیا کەهەمان محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی ئەشتەر بوو. هوشام کەنیز و ژنەکانی ئەوی بۆ لای مەنسور ڕەوانە کرد و مەنسور، ئەوانی بۆ لای کارگوزارەکەی لەمەدینە نارد و نامەیەکی بۆ نووسی و ڕاستی نەژاد و ڕێزی بنەماڵەکەی ئەوانی بیر خستەوە. فەرمانی پێدا ماوەیەك دواتر بیگەڕێننەوە بۆ بنەماڵەکەی.

## فەرمانداری باوکی جەعفەر عومەر کوڕی حەفس لەئەفریقییە

لەمساڵە، مەنسور، باوکی جەعفەر عومەر کوڕی حەفس لەبنەماڵەی قوبەیسە کوڕی باوکی سەفرە برای موهەلیبی وەك فەرمانداری ئەفریقییە دەستنیشان کرد. لەبەر ئەوەی بۆ بنەماڵەی موهەلیب دەگەڕایەوە چوونکە کەسێکی ناودار بوو.

هۆکاری ڕۆشتنەکەی بۆ ئەو سەرزەمینە ئەوە بوو: کاتێك مەنسور هەواڵی کوژرانی ئەغلەب کوڕی سالمی بیست، بۆ لەناوچوونی ئەفریقییە ترسا و لەبەر

ئەوە عومەر كوڕی حەفسی وەك فەرماندار دەستنیشان كرد. عومەر لەمانگی سەفەری ١٥١ كۆچی/٧٦٨ زایینی لەگەڵ پێنسەد سوار گەیشتە ئەو سەرزەمینە و گەورەكانی شار لەدەوری كۆبوونەوە. ڕێزی لێگرتن و چاكەی لەگەڵ كردن. پەیمانی هاوكارییان بەست و بۆ ماوەی سێ ساڵ بارودۆخی سەقامگیر كرد.

ئەو بەرەو زاب بەڕێكەوت و بەفەرمانی مەنسور بناغەی شاری تونبەی داڕشت. عومەر كوڕی حەفس، حەبیب كوڕی حەبیبی موهەلەبی لەجێگەی خۆی لەقەیرەوان دانا و ئەفریقییە سوپا و شەڕكەری تیا نەما و بەربەرییەكان لەو سەرزەمینە ئاڵای شۆڕشیان بەرز كردەوە. حەبیب بۆ جەنگی ئەوان بەڕێكەوت و كوژرا و بەربەرییەكان لەترییۆلی ئاڵای شۆڕشیان بەرز كردەوە و باوكی حاتەمی ئەبازییان وەك سەروەری خۆیان دیاریكرد. (لەخەواریج) باوكی ئەبازی ناوی یەعقوب كوڕی حەبیب موالی كێندە بوو. كارگوزاری عومەر كوڕی حەفس لەترییۆلی جونەید كوڕی بەشاری ئەسادی بوو. ئەو نامەی بۆ عومەر نووسی و داوای هاوكاری لێكرد. عومەر سوپایەكی بۆ هاوكاری كردنی ئەو ڕەوانە كرد. ڕووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕێكی قورس دەستپێكرد و شكستیان خوارد و بەرەو كابس بەڕێكەوتن. باوكی حاتەم گەمارۆی خستە سەریان. عومەر نیشتەجێی زاب و سەرقاڵی دروست كردنی شاری تونبە بوو. ئەفریقییە لەهەموو شوێنێكەوە شكستی خوارد و خەڵكان ڕوویان لەتەنبە كرد و لەگەڵ دوانزە سوپا لەدەروی شارەكە كۆبوونەوە. لەناو ئەوان: باوكی قوڕەی سوفرا لەگەڵ چل هەزار شەڕكەر، عەبدولرەحمان كوڕی ڕۆستەم لەگەڵ پانزە هەزار پیاوی شەڕكەر، باوكی حاتەم لەگەڵ سوپایەكی گەورە، عاسمی سەدرانی ئەبازی لەگەڵ شەش هەزار جەنگاوەری بەهێز، مەسعودی زەناتی ئەبازی لەگەڵ دە هەزار سوار و كەسانێكی دیكە.

كاتێك عومەر بینی گەمارۆی خراوەتەسەر، مەبەستی ڕۆشتنەدەر و ڕووبەروو بوونەوەی ئەوانی كرد بەڵام هاوەڵانی ڕێگەی ئەم كارەیان لێگرت و وتیان: ئەگەر تۆ لەناو بچیت، عەرەبەكان لەناو دەچن. بیری لەڕێگە چارە كردەوە و كەسی بۆ لای باوكی قوڕەی سەركردەی سەفەرییەكان ڕەوانە كرد. شەست هەزار درەمی پێدا تا دەست لەگەمارۆكەی هەڵبگرێت. باوكی قوڕەی وتی: دوای ئەوەی دوای چل ساڵ

وەك جێگری سلاویان بۆ ناردووم، جەنگ دژی ئێوە لەبەرابەر سامانێکی کەم بایی ئەم دنیا پشتگوێ بخەم؟ بەپێشنیارەکەیان رازی نەبوو.

کەسێکی بۆ لای براکەی باوکی قورەی ڕەوانە کرد و چل هەزار درەم و جل و بەرگی گرانبایی پێشکەش کرد تا سەفەرییەکان لەدەروی باوکی قورەی بلاوە پێبکات. ئەو، رازی بوو و هەمان شەو بەرێکەوت و سوپاییەکان بەدوای ئەودا بەرێکەوتن و ڕۆشتنە ناو شارەکان. باوکی سوفرا بەناچاری بەدوای ئەوان ملی رێگەی گرتەبەر. کاتێك سەفەرییەکان گەڕانەوە، عومەر سوپایەکی بۆ شەڕی کوڕی رۆستەم لەتەهوزا ڕەوانە کرد. کوڕی تەهوزا ڕەچەڵەکی دەگەڕایەوە بۆ بەربەرییەکان. شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و کوڕی تەهوزا شکستی خوارد و بەرەو تاهێرت پاشەکشێی کرد و کاری ئەبازییەکان بۆ جەنگ دژی عومەر سست و بەرەو تونبە بەرێکەوتن تا لەقەیرەوان خۆیان بەدوور بگرن. باوکی حاتەم گەمارۆی خستە سەر و عومەر لەتونبە دەژیا. کاروبارەکانی سامان دەدا و لەبەرابەر دراوسێکانی لەخەواریج، پارێزگاری لەشارەکە دەکرد. کاتێك گرفتاری و تەنگ و چەڵمەی کاروبارەکانی لەقەیرەوان بینی، بەرەو ئەوێ بەرێکەوت و کاتێك عومەر کوڕی حەفس رووی کردە قەیرەوان، سوپایەکی گەورە لەتونبە مایەوە.

کاتێك باوکی قورەی لەهاتنی عومەر کوڕی حەفس ئاگادار بوویەوە، رووی کردە تونبە و گەمارۆی خستەسەر. سوپاییەکانی ناو شارەکە هاتنەدەر و شەڕیان دەستپێکرد. ژمارەیەکی فراوان لەسوپاکەی باوکی قورەی کوژرا.

بەلام باوکی حاتەم، کاتێك گەمارۆی دەخستە سەر قەیرەوان، ژمارەی سوپاکەی فراوان و بازنەی گەمارۆکەی تەنگتر کردەوە. لەم کاتەدا نە لەناو گەنجخانەکانی ئەو شارە یەك پشیز دەبینرا نە لەناو هەنبارەکانی خواردن. گەمارۆکە هەشت مانگ درێژەی کێشا بەو شێوەی سوپاییەکان دەهاتنەدەر و بەیانی و نیوەڕۆ لەگەڵ خەواریج دەجەنگان تا ئەو کاتەی برسیەتی تەنگی پێهەڵچنین و ناچار سەگ و چوارپێکانی خۆیانیان دەخوارد. ژمارەیەکی زۆر لەو خەڵکە پەیوەستی بەربەرییەکان بوون و ئەوەندەی نەمابوو خەواریج بڕۆنە ناو شارەکە بەلام لەم کاتەدا هەواڵی هاتنی عومەر کوڕی حەفسیان لەتونبەوە پێگەیشت. هەریش لەگەڵ

حەوتسەد سوار دابەزی و خەواریج هەموویان قەیرەوانیان بەجێهێشت و روویان کردە ئەو. کاتێك ئەوێیان بەجێهێشت، عومەر بەرەو تونس بەڕێکەوت. بەربەرییەکان شوێنی کەوتن و ئەو بۆ قەیرەوان گەڕایەوە و هەوڵی دەدا و بەدژواریی توانییان نیازەکانی خۆیان وەك خواردن و توێشو و چوارپێ و مەڕومالآت ببەنە ناو شارەکە. باوکی حاتەم و بەربەرییەکان هاتن و گەمارۆیان خستەسەر تا ئەوەی ناچار چوارپێ و مەڕومالآتەکەی خۆیان خوارد و رۆژانە ئاگری جەنگ بڵێسەی دەسەند.

کاتێك بارودۆخ بۆ عومەر و سوپاکەی دژوار بوو، پێی وتن: ئەندێشەی پەسەند ئەوەیە لەشارەکە بڕۆمەدەر و هێرش بکەمە سەر شارەکانی بەربەر و دەست بەسەر خواردن و نیازەکانی ئەواندا بگرم و شارەکەی ئێوەی پێ پڕ بکەم. دواتر دژی ئەوان بجەنگم و بەسەرکەوتنی بێ چەند و چوون شانازی بەخۆمەوە بکەم. وتیان: دوای ڕۆشتنی تۆ، لەوان دەترسین. وتی: فلآنە و فیسارە کەس دەنێرم تا ئەم کارە ئەنجام بدەن. رازی بوون. کاتێك بەو دوو پیاوەی وت: وتیان: ئێمە تۆ لێرە بەجێناهێڵین و لەتۆ دوور ناکەوینەوە.

مەبەستی ئەوەی کرد خۆی بخاتە ناو گێژاوی لەناوچوونەوە بەلآم ئاگادار بوویەوە مەنسور، یەزید کوڕی حاتەم کوڕی قوتەیبەی لەگەڵ شەست هەزار شەڕکەر بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کردووە. ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون ڕێنوێنیان کرد تا جەنگ دوا بخات تا ئەو کاتەی سوپای پشتیوان دەگات. بەلآم رازی نەبوو، ڕۆشتەدەر و جەنگا و رۆژی ١٥ زیحەجەی ١٥٤ کۆچی/ نۆڤەمبەری ٧٧٢ زایینی کوژرا. حومەید کوڕی سەخر زڕبرای دایکی عومەر، سەرکردایەتی خەڵکی گرتەدەست و رووبەرووی باوکی حاتەم بوویەوە. پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست لەسەر ئەو بنەمای حومەید و هاوەڵانی بەهەمان شێوە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی مەنسور بن و باوکی حاتەم لەناو شارەکاندا ئازادیان بکات و دەست بەسەر کەرەستەکانی جەنگی ئەواندا نەگرێت. ئەو رازی بوو و دەرگاکانی قەیرەوانی بەروودا کرایەوە. باوکی حاتەم دەروازەکانی قەیرەوانی سوتاند و بورج ودیوارەکەی وێران کرد.

لەهاتنی یەزید کوڕی حاتەم ئاگاداریان کردەوە. رووی کردە ترییۆلی و فەرمانی بەهاوڕێکەی لەقەیرەواندا کەرەستەکانی جەنگ لەشەڕکەران وەربگرێت و ئەوان لەدەوری یەك بلاّوە پیّ بکات. دەستەیەك لەهاوەلاّنی نارازی بوون و وتیان: پەیمان ناشکێنین. سەرکردەی نەیارەکان، عومەر کوڕی عوسمانی فیهری بوو. لەقەیرەوان شۆڕشی کرد و هاوەلاّنی باوکی حاتەمی کوشتار کرد. باوکی حاتەم گەڕایەوە و عومەر کوڕی عوسمان بۆ تونس هەلاّت. باوکی حاتەم بۆ رووبەروو بوونەوە لەگەڵ یەزید کوڕی حاتەم رووی کردە ترییۆلی.

دەلێن: لەسەرەتای جەنگ لەنێوان خەواریج و سوپاکەی عومەر کوڕی حەفس، سێسەد و حەفتا و پێنج جەنگ لەنێوان ئەوان روویدا.

## فەرمانداری یەزید کوڕی حاتەم لەئەفریقییە و جەنگ لەگەڵ خەواریج

کاتێك مەنسور ئاگادار بوویەوە لەلایەن خەواریجەوە چ بەلاّیەك بەسەر عومەر کوڕی حەفسدا هاتووە، یەزید کوڕی حاتەم کوڕی باوکی سوفرەی لەگەڵ شەست هەزار جەنگاوەر بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەو لەساڵی١٥٤ کۆچی/٧٧٢ زایینی گەیشتە ئەو سەرزەمینە. کاتێك نزیك کەوتەوە، دەستەیەك لەسوپاییەکان پەیوەستی بوون و لەگەڵ ئەوان بەرەو ترییۆلی بەرێکەوتن. باوکی حاتەم رووی کردە کوێستانەکانی نەفوسە. یەزید دەستەیەك لەسوپاییەکانی بۆ کاس نارد. باوکی حاتەم رووبەروویان بوویەوە و شکستی پێهێنان. ئەوان بۆ لای یەزید گەڕانەوە و باوکی حاتەم لەشوێنێکی دژوار بۆ گوزەر کردن، ئوردووی لێدا و سەنگەری بەدەوری سوپاکەیدا هەلّکەند. یەزید سوپاکەی خۆی ئامادە کرد و بەرێکەوت و لەمانگی رەبیعی یەکەم ١٥٥ کۆچی/ فەوریەی ٧٧٣ زایینی شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان دەستی پێکرد و بەربەرییەکان شکستیان خوارد و باوکی حاتەم و هاوەلاّنی کوژران. یەزید لەسەراسەری کوێستان و دەشت شوێنیان کەوت و کوشتاری کردن. ژمارەی کوژراوەکانیان بەسی هەزار کەس خەملاّندووە.

بنەماڵەی موهەلیب هەموو خەواریجیان کوشتار کرد و هاواریان دەکرد: ئەی ئەو کەسانەی داوای خوێنی عومەر کوڕی حەفس دەکەن! ئەو یەك مانگ مایەوە و

خەواریجییەکانی دەکوشت و دواتر rووی کردە قەیرەوان.

عەبدولرەحمان کوری حەبیب کوری عەبدولرەحمانی فیهری لەگەڵ باوکی حاتەم بوو. ئەو بۆ کەتامە هەڵات. یەزید کوری حاتەم سوپایەکی بۆ جەنگی ئەوان رەوانە کرد و گەمارۆیان خستە سەر بەربەرییەکان و دەستیان بەسەردا گرتن. ژمارەیەکی فراوان لەوانیان کوشت و عەبدولرەحمان هەڵات. هەموو ئەوکەسانەی لەگەڵ ئەودا بوون، کوژران و ئەفریقییە بەتەواوی لەخەواریج پاك کرایەوە. یەزید کردارێکی چاکەکارانەی گرتەبەر و خەڵکان ئاسودە بوون تا ئەوەی ورفەجوومە لەساڵی ١٦٤ کۆچی/ ٧٨٠ زایینی لەسەرزەمینی زاب ئاڵای شۆرشی بەرز کردەوە کەفەرماندارەکەی ئەیووبی هواری بوو. ئەو سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەوان رەوانە کرد و یەزید کوری مەجزای موهەلیب وەك سەرکردەی ئەوان دانا. شەریان کرد و یەزید شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران و موخاریق کوری غەفار فەرمانداری زاب کوژرا و لەجێگەی ئەو موهەلیب کوری یەزید کوری موهەلیب هاتەسەر کار. یەزید دەستەیەکی فراوان لەجەنگاوەرانی بۆ هاوکاری ئەوان نارد و عەلا کوری سەعیدی موهەلیبی وەك فەرماندەی ئەوان دیاریکرد. هەڵتووان پەیوەستیان بوون و لەگەڵ سوپاکەی ورفەجوومە شەریان کرد. شەر rووی لەدژواری و بەربەرییەکان وئەییووب شکستیان خوارد و لەهەموو شوێنەکان کوشتار کران تا ئەوەی بەتەواوی لەناوچوون. یەك کەس لەسوپاکەی ئەو نەکوژرا.

یەزید لەمانگی رەمەزانی ١٧٠ کۆچی/ مارسی ٧٨٧ زایینی مرد. رۆژگاری فەرمانرەوایەتی ئەو ١٥ ساڵ و سێ مانگ درێژەی کێشا. ئەو، کورەکەی یانی داوودی وەك جێگری خۆی لەئەفریقییە دەستنیشان کرد.

## دروست کردنی روصافە بۆ مەهدی

لەم ساڵەدا لەمانگی شەوال/ ئۆکتۆبەری ٧٦٨ زایینی مەهدی لەخوراسان گەرایەوە. کەسان و بنەماڵەکەی لەشام و کوفە و بەسرە بۆ بەخێرهێنانی ئەو کۆبوونەوە و بەخێرهاتنیان کرد. مەهدی دیاری گرانبایی پێشکەش کردن لەگەڵ چوارپێ و جل و بەرگی تازە. مەنسوریش بەهەمان شێوە چاکەی لەگەڵ کردن.

فەرمانیدا روصافە بۆ مەهدی دروست بکەن.

هۆکاری دروست کردنەکەی ئەوە بوو: دەستەیەك لەسوپاییەکان لەبەرابەر مەنسور بوێر و دژایەتی ئەویان دەکرد و ئەم پێشهاتە لە(دەروازەوەی زێڕین) روویدا. رۆژێك قوسەم کوڕی عەباس کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەباس کەپیری ئەو بنەماڵە و لای ئەوان بەکەسێکی رێزدار لەقەڵەم دەدرا و بەجۆرێك لەجۆرەکان وەك پێشەوا سەیریان دەکرد، رۆشتە لای مەنسور. مەنسور وتی: دەبینی سەربازەکان چۆن دژایەتی ئێمە دەکەن؟ دەترسم یەکبگرن و خەلافەتمان لەدەست بڕوات. چی دەفەرموویت؟

وتی: ئەی سەرورەی باوەڕداران، بۆچوونێکم هەیە ئەگەر ئاشکرای بکەم، بەفیڕۆ دەڕوات و ئەگەر رێگەم بدەیت، ئەنجامی دەدەم و بەوشێوەیە خەلافەتت پایەدار و سوپاییەکان ترسیان لێ دەنیشێت. وتی: لەخەلافەتی من کارێك ئەنجام دەدەیت بێ ئەوەی بزانم چییە؟ وتی: ئەگەر لای تۆ کەسێکی بێ ئەزموونم، راوێژم پێ مەکە و ئەگەر کەسێکی بڕواپێکراوم، رێگەبدە بیخەمە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. مەنسور وتی: کارەکەی خۆت ئەنجام بدە.

قوسەم گەڕایەوە بۆ ماڵ. یەکێك لەکۆیلەکانی بانگ کرد و پێی وت: بەیانی پێش من لەماڵ بڕۆدەر و لەماڵی سەروەری باوەڕداران دانیشە. کاتێك من هاتم و لەناو کەسانی خاوەن پێگەدا دانیشتم، جڵەوی ئێسترەکەم بگرە و بە پێغەمبەر (د.خ) و بەعەباس و بەسەروەری باوەڕداران سوێندم بدە، لەشوێنەکەی خۆم بێستەم و گوێ لەپرسیارەکەت بگرم و وەڵامت بدەمەوە. لەوێ بەشێوەیەکی توند قسەت لەگەڵ دەکەم و دوورت دەخەمەوە. تۆ مەترسە و پرسیارەکەت دووبارە بکەرەوە. من قامچی بەرز دەکەمەوە بەڵام تۆ، وتەکانت دووبارە بکەرەوە و بڵێ: کام خەڵکە لەپێشترن، یەمانییەکان یا موزێرییەکان؟

کاتێك وەڵامم دایتەوە، جڵەوی ئێسترەکەم بەربدە و بۆ هەمیشە ئازاد بژی.

کۆیلە فەرمانەکانی ئەنجامدا و قوسەم وتەکانی خۆی هێنایە سەرزمان. لەم کاتەدا، لەکۆتاییدا وتی: موزێرییەکان لەپێشترن چوونکە پێغەمبەر (د.خ) لەوانە و نووسراوی خواوەند لەناو ئەواندا هاتۆتەخوار. ماڵی خوا لەناوچەکانی ئەواندایە و

جێگرەکانی خواوەند لەوانن.

یەمانییەکان تورە بوون چوونکە باسی ڕێز و پێگەی ئەوانی نەکرد. یەکێك لەوان وتی: هەرگیز، بێ لەبەرچاو گرتنی لەپێشی یەمانییەکان، بابەتی لەو چەشنە ڕاست نییە. دواتر بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی وت: هەستە و ئێستری ئەو پیرە پیاوە بگرە و ڕێگە لەڕۆشتنی ئەو بگرە. هەستا و ئەو کارەی کرد. ئەوەندەی نەما بوو ئێسترەکە چۆك دابدات. موزێرییەکان تورە بوون و وتیان: ئایا ڕەوایە بەمشێوەیە لەگەڵ پیری ئێمە هەڵس و کەوت بکەن؟ یەکێك لەوان فەرمانی بەکۆیلەکەیادا کەبەشمشێر لەدەستی ئەو کۆیلە داماوەیدا و دەستی بڕی. هەردوولا تورە بوون و خرۆشان.

قوسەم ڕۆشتە لای مەنسور و سوپاییەکان هەرکام لەسوچێکەوە ڕۆشتن. موزێرییەکان بوونە دەستەیەك، ڕەبیعییەکان دەستەیەك و خوراسانییەکان دەستەیەك. قوسەم بەمەنسوری وت: دوو بەرەکیم لەناو سوپاییەکانت دروست کرد و ئەوانم کردە چەندین دەستەی نەیار بەشێوەیەك هەرکام لەوان دژی تۆ کارێك ئەنجام بدات، دەترسێن بەهۆی دەستەکەی دیکەوە سەرکوت بکرێت. بەڵام هێشتا کارێکی دیکە ماوە. ئەویش ئەوەیە کوڕەکەت لەدەربار بەریتەدەر و لەشوێنێکی دیکە جێگیری بکەیت و دستەیەك لەگەڵ سوپاییەکان لەگەڵ ئەودا ڕەوانە بکەیت. بەجۆرێك ئەو شوێنە ببێتە شارێك وئێرە شارێك. ئەگەر ئەوان ڕێگەی دژایەتی و نەیاری بگرنەبەر، بەهێزی ئەمان سەرکوتیان دەکەیت و ئەگەر کەسانی ئێرە ڕێگەی دژایەتی بگرنەبەر، بەهۆی ئەوانەوە سەرکوتیان دەکەیت. ئەگەر هۆزێك دژی تۆ شۆڕش بکات، بەهێزی هۆزێکی دیکە لەناوی دەبەیت. مەنسور بەبۆچوونەکەی ڕازی و بەمشێوەیە خەلافەتەکەی سەقامگیر بوو. ئەو ڕوصافەی دروست کرد و سالح، پێشنوێژی نوێژگە، دروست کردنی شارەکەی گرتە ئەستۆ.

## کوژرانی سلێمان کوڕی حەکیمی عەبدی

لەمساڵەدا، عوقەبە کوڕی سولەم لەبەسرە ڕۆشتەدەر و نافع کوڕی عوقەبەی وەك جێگری خۆی دانا. ڕووی کردە بەحرەین و سلێمان کوڕی حەکیمی کوشت و خەڵکانی بەحرەینی هاوشێوەی دیل، گرفتار کرد. دەستەیەك لەگرفتار و ئەسیرەکانی بۆ مەنسور ڕەوانە کرد. ئەو، دەستەیەکی کوشت و دەستەیەکی بەمەهدی بەخشی کەئەوانی ئازاد کرد و بەبەخشینی جل و بەرگی گرانبایی دڵنەوایی کردن و ڕق و کینەی لەدڵی ئەوان شۆردەوە و بەلۆکە سەری بڕین. دواتر عوقەبەی لەفەرمانداری بەسرە دوورخستەوە.

دەستەیەك گومان دەکەن مەنسور لەم ساڵەدا مەعن کوڕی زایدەی شەیبانی لەفەرمانڕەوایەتی سیستان دوورخستەوە.

محەممەد کوڕی ئیبراهیمی (ڕێبەر) فەرمانداری مەککە و تاییف ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. فەرمانداری مەدینە حەسەن کوڕی زەید بوو، فەرمانداری بەسرە جابر کوڕی تەوبەی کەلابی، فەرمانداری کوفە محەممەد کوڕی سلێمان و فەرمانداری میسر یەزید کوڕی حاتەم بوو.

## دەسپێکی کاری شەقنا و شۆڕشی ئەو لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا، لەرۆژهەڵاتی ئاندۆلۆس، پیاوێك لەبەربەرییەکانی مەکناسە کەمناڵانی فێر دەکرد و ناوی شەقنا کوڕی عەبدواحید و دایکی بەفاتیمە ناو دەبرا، وتی: لەبنەماڵەی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە و باوەگەورێیی ئەو حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ناوی راستی خۆی عەبدواللە کوڕی محەممەدە. ئەو، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە لەشنتە بەرییە مایەوە و دەستەیەکی فراوان لەبەربەرییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و هێزی زیادی کرد. عەبدولرەحمان ئومەوی بۆ جەنگی ئەوبەرێکەوت بەڵام شەقنا خۆڕاگری نەکرد و رووی کردە کوێستانەکان. ئەو، کاتێك بارودۆخی بەئارام دەبینی، شۆڕشی دەکرد و کاتێك لەگیانی دەترسا، پەنای بۆ کوێستانەکان دەبرد بەشێوەیەك کەس نەیدەواتی شوێنی بکەوێت.

عەبدولرەحمان، حەبیب کوڕی عەبدولمەلیکی لەتۆڵدۆ دانا. حەبیب، سلێمان کوڕی عوسمان کوڕی مەروان کوڕی ئەبان کوڕی عوسمانی وەك فەرمانڕەوای شەنت بەرییە دەستنیشان کرد و فەرمانی شوێن کەوتن و لەناو بردنی شەقنای پێدا. شەقنا لەشەنت بەرییە دابەزی، سلێمانی گرت و کوشتی و هێزی فراوانتر بوو. ناو وناوبانگی کەوتە سەرزاران و دەستی بەسەر ناوچەی قوریەدا گرت و خراپەکاری دەستپێکرد.

عەبدولرەحمانی ئومەوی لەساڵی ١٥٢ کۆچی/ ٧٦٩ زایینی گەڕایەوە و خۆی بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت بەڵام شەقنا خۆڕاگری نەکرد و عەبدولرەحمان سەری لێ شێوا. شوێنی نەکەوت و لەساڵی ١٥٣ کۆچی/ ٧٧٠ زایینی، بەدری کۆیلەی خۆی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. شەقنا هەڵات و قەڵاکەی یانی شەترانی چۆڵ کرد. عەبدولرەحمان خۆی لە ساڵی ١٥٤ کۆچی/ ٧٧١ زایینی بۆ جەنگی ئەو ڕۆشت بەڵام دووبارە شەقنا خۆڕاگری نەکرد و عەبدولرەحمان لەساڵی ١٥٥ کۆچی/ ٧٧٢ زایینی، باوکی عوسمان عوبەیدالله کوڕی عوسمانی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. شەقنا ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و گەندەڵی و فیڕۆیی لەناو سوپاکەیدا دروست کرد. عوبەیدالله هەڵات و شەقنا دەستی بەسەر ئوردووگاکەیدا گرت و دەستەیەك لەئومەوییەکانی ناو سوپاکەی کوشتار کرد.

لەساڵی ١٥٥ کۆچی/ ٧٧٢ زایینی، دووبارە شەقنا دوای تاڵان کردنی سوپاکەی عوبەیدالله، بەرەو قەڵای هوارییان ناسراو بەناو و نیشانی مەداین، گەڕایەوە. کارگوزارێکی عەبدولرەحمان لەوێ فەرمانڕەوایەتی دەکرد. شەقنا ڕێگەی فریودانی ئەوی گرتەبەر و ئەوی لەقەڵاکەی هێنایەدەر. شەقنا ئەوی کوشت و ئەسپ و کەرەستەکانی جەنگ و هەموو ساز و بەرگی ئەوانی تاڵان کرد.

## کوژرانی مەعن کوڕی زایدە

لەمساڵەدا مەعن کوڕی زایدەی شەیبانی لەسیستان کوژرا. مەنسور وەك فەرماندای ئەو ناوچە دەستنیشانی کردبوو. کاتێك گەیشتە ئەو سەرزەمینە، پەیك و پەیامی بۆ ڕۆتبیل نارد و فەرمانی پێدا ئەوەی ساڵانە بڕیاریان لەسەرداوە،

ڕەوانەی بکات. ئەو کەل و پەلی ڕەوانە و بەهای ئەوانی خەملاند. مەعن توڕە بوو، بەرەو روخج کەوتە ڕێ. فەرماندەی پێشەنگەکانی برازاکەی موزید کوڕی زایدە بوو. بینی رۆتبیل ڕێگەی زابولستانی گرتۆتەبەر تا هاوین لەو ناوچەیە بەسەر ببات. دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت و کەسانێکی زۆری ئەسیر کرد. فەرەجی روخجی ( منالێك کەناوی باوکی زیاد بوو) لەناو ئەواندا دەبینرا. مەعن تەپ و تۆزێکی بینی کەکەرە کێوییەکان دروستیان کردبوو. گومانی برد سوپایەکە کە بۆئازادی ئەسیرەکان هاتووە. فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد. ژمارەیەکی زۆر لەوانی کوشت. دواتر راستی تەپ وتۆزەکەی بۆ دەرکەوت و دەستی لەکوشتاری ئەوان هەڵگرت.

مەعن لەهێرش کردن لەکاتی زستان ترسا و بۆ بوست گەڕایەوە. دەستەیەك لەخەواریج کردەکانی ئەویان بەناپەسەند و ناڕەوا دەزانی. ڕۆشتنە ناو ئەو کرێکارانەی خانوویان بۆ دروست دەکرد. کاتێك گەیشتنە دروست کردنی بانی ماڵەکەی، شمشێرەکانیان لەناو قامیشەکاندا شاردەوە و دواتر ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی. هێرشیان کردەسەر و بەشێوەیەکی لەناکاو کوشتیان. یەکێك لەوان بەخەنجەر سکی هەڵدڕی و یەکی دیکە بەشمشێر لێیدا و وتی: من جوامێرێکی تاقیم، تاق گوندێکە لەنزیکی زرنگ. یەزید کوڕی مەزید هەموویانی کوشت بێ ئەوەی کەسیان رزگاری ببێت.

دواتر یەزید سەرقاڵی ڕێکخستنی کاروباری سیستان بوو. سەختگیری ئەو بۆ عەرەب و عەجەمەکانی ئەو ناوچە دژوار و ناپەسەند بوو. یەکێك لەعەرەبەکان بیری لەفێڵێك کردەوە بەمشێوەیە کەنامەی بۆ مەنسور نووسی و ئاگاداری کردەوە کەنامەکانی مەهدی بۆ ئەو، سەرگەردان و پەرێشانی کردووە. داوای لێکرد بیبەخشێت. مەنسور لەو کارە توڕە بوو و جوێنی پێدا. مەهدی نامەکەی پشتراست کردەوە. ئەوی لەسەر کار لابرد و زیندانی کرد و هەموو شتەکانی ئەوی فرۆشت. دواتر سەبارەت بەو قسەیان لەگەڵ کرد و ئەوی بۆ شاری ئاشتی (مدینە السلام) نارد. وەك کەسێکی ریسوا لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد تا ئەوەی خەواریج لەسەر پرد چاویان پێی کەوت و ئەو، کوشتاری کردن و پێگەی تاڕادەیەك بەرز

بوویەوە. دواتر ئەوی بۆ لای (یوسف برم) لەخوراسان ڕەوانە کرد. ئەستێرەی بەختی رووی لەدرەوشانەوە بوو تا کاتی مردن.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەمساڵەدا عەبدوەهاب کوڕی ئیبراهیمی رێبەر، بۆ شەڕی هاوینە بەرێکەوت.

هەروەها لەم ساڵەدا، مەنسور، ئیسماعیل کوڕی خالید کوڕی عەبدوڵلەی قەسری وەك فەرمانداری موسڵ دەستنیشان کرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عەبدوالله کوڕی عەون لەدایك بووی ساڵی ٦٦ کۆچی/٦٨٦ زایینی، ئوسید کع فەرمانداری خوراسان لەزیحەججە/دێسامبەری ٧٦٨ زایینی، حەنزەلە کوڕی ئەبی سوفیانی جومەحی، عەلی کوڕی ساڵح کوڕی حەبی برای حەسەن کوڕی ساڵح کەهەردووکیان کەسانێکی خواپەرەست و چاکەکار و شوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و دووی کۆچی ( ٧٦٩ زایینی )

لەم ساڵەدا حومەید کوڕی قەحتەبە بۆ جەنگی کابول بەڕێکەوت. مەنسور لەساڵی ١٥١ کۆچی/ ٧٦٨ زایینی ئەوی وەك فەرمانداری خوراسان دەستنیشان کردبوو.

جەنگی هاوینە لەم ساڵەدا بەفەرماندەیی عەبدوەهاب کوڕی ئیبراهیم یا محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ڕێبەر ئەنجام درا بەڵام لەقوڵایی خاکی دوژمن پێشڕەوییان نەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور، جابر کوڕی تەوبەی لەبەسرە لابرد و یەزید کوڕی مەنسوری وەك فەرمانڕەوا ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا مەنسور، ئەساسیجی کوشت لەبەر ئەوەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکرد و دووبەرەکی لەناو عەرەبەکانی ئەفریقییە هێنابوویە ئاراوە. ئەویان بردە لای مەنسور و سەری بڕی.

مەنسور ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی حاتەم لەفەرمانڕەوایەتی میسر دوورخرایەوە و محەممەد کوڕی سەعید لەجێگەی ئەو دانرا. کارگوزاری شارەکان (جگە لەوانەی ئاماژەمان پێدان) هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی موسلیم کوڕی شەهاب برازای محەممەد کوڕی شەهابی زوهری کەمامەکەی حەدیسی لەو دەهێنایەوە، یوسف کوڕی یەزیدی ئەیلی کەئەویش لە محەممەدی زوهری حەدیسی هێناوەتەوە، تەڵحە کوڕی عومەری حەزرەمی، ئیبراهیم کوڕی باوکی عەبلە، شەمری کوڕی یەقزان کوڕی عامری عوقەیلی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجاو سێی کۆچی (٧٧٠ زایینی)

لەم ساڵەدا مەنسور لەمەککە بۆ بەسرە گەڕایەوە و سوپایەکی لەرێگەی دەریاوە بۆ کورك ڕازاندەوە کەپێشتر ئاماژەمان بەهێرشی ئەوان بۆ سەر جودە کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور، باوکی ئەیووبی موریانی و برازاکەی دەستگیر کرد. مونازر لەوان بوو. دەبیرەکەی یانی ئەبان کوڕی سەدەقە دژی ئەوان هاتە زمان و بوختانی بۆ هەڵبەستن.

دەڵێن: هۆکاری گرتنەکەی ئەوە بوو: مەنسور لەرۆژگاری ئومەوییەکان، بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتە ناو موسڵ و دوور لەچاوی خەڵکان لەو شارەدا دەژیا. ژنێکی لەئەزدییەکان هێنا و ژنەکە دووگیان بوو. دواتر لەموسڵ ڕۆشت و یادداشتێکی بەژنەکەدا و وتی: کاتێك هەواڵی بنیاتنانی دەوڵەتی هاشمییەکانت بیست، ئەم یادداشتە بۆ خاوەنی ئەو دەوڵەتە ڕەوانە بکە و دڵنیابە دەتناسێتەوە. ژنەکە کوڕێکی هێنایە دنیا و ناوینا جەعفەر. ئەو گەورە بوو و گەشەی کرد و نووسین و نیازمەندییەکانی دیکە فێر بوو.

مەنسور فەرمانڕەوای گرتەدەست و جەعفەر بەرەو بەغداد بەرێکەوت و پەیوەستی ئەیووب بوو. ئەوی کردە یەکێك لەدەبیرەکانی دەبیرخانە. ڕۆژێك مەنسور داوای نووسەرێکی لەباوکی ئەییووب کرد تا شتێکی بۆ بنوسێت. ئەو جەعفەری بۆ لای مەنسور نارد. کاتێك مەنسور ئەوی بینی، خۆشی ویست و هاورێیەتی خۆی بۆ دەربڕی. کاتێك فەرمانی نوسینی پێدا، زمان پاراوی و خۆش نوسینی ئەوی بۆ دەرکەوت. پرسی: خەڵکی کوێیە و ناوی باوکی چییە؟ بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و یادداشتەکەی نیشاندا. مەنسور ئەوی ناسییەوە و هەموو کاتێك بەبیانوی نوسین ئەوی بانگ دەکرد. باوکی ئەیووب لێی ترسا.

مەنسور رۆژێك بانگی کرد و بڕێك سامانی پێدا. فەرمانی پێدا بەرەو بەسرە بڕوات و دایکی بێنێت. جەعفەر لەبەغداد ڕۆشتەدەر. باوکی ئەییووب چەندین سیخوری لەسەر ئەودانا بوو کە لەکارەکانی ئاگاداریان دەکردەوە. کاتێك شوێنی سەفەرەکەی زانی، کەسێکی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد کە لەرێگە و بەشێوەیەکی لەناکاو کوشتی. کاتێك گەڕانەوەی زۆری خایاند، مەنسور پەیك و پەیامی بۆ دایکی کوڕەکە لەموسڵ ڕەوانە کرد و لەو ژنەی پرسی: جەعفەر لەکوێیە؟ ژنەکە بیری خستەوە کەسوراغی

نازانێت جگە لەوەی لەدەبیرخانە کار دەکات و پیشەی نووسینی هەیە و لەبەغداد دەژیت. کاتێك مەنسور ئەمەی زانی، کەسی بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕەوانە کرد. نێردراو گەیشتە شوێنێك بەڵام زیاتر لەویٚ نەیتوانی بڕوات. زانی لەهەمان شوێن کوژراوە. لێکۆڵینەوەی کرد و دڵنیا بوو لەوەی بەدەستی باوکی ئەیووب لەناو چووە. ئەوی گرت و سەرکوتی کرد و کوشتی.

هەروەها مەنسور، عوباد، کۆیلەکەی خۆی و هەرسەمە کوڕی ئەعیەنی لەخوراسان گرت. هەردووکیانیان بەزنجیر بەستەوە و هێنایان. لەبەر ئەوە ئەم کارەی کرد چوونکە ئەو دوانە شوێنکەوتەی عیسا کوڕی موسا بوون.

هەروەها مەنسور فەرمانیدا لەتەلبیس، ئەو کەسانەی کڵاوی درێژ لەسەر دەکەن، دەستگیر بکەن. باوکی دولامە ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

و کنا نرجی من امام زیادة      فزاد الامام المصطفى فی القلانس

واتاکەی: هیوای زیاد کردنمان لەرێبەر دەکرد بەڵام رێبەری هەڵبژێردراو، گوشاری لەسەر کڵاوە درێژەکان زیاد کرد.

مەعیوف کوڕی یەحیا جەحوری لەم ساڵەدا شەڕی هاوینەی کرد و لەشەودا، خۆی گەیاندە یەکێك لەقەڵاکانی شارەکانی ڕۆم و ژمارەیەکی فراوانی ئەسیر کرد چوونکە خەڵکان بەئاسوودەی خەوتبوون. دواتر مەبەستی هێرش کردنە سەر لاتاکیای (لازقیە) کرد و ئەو شارەی وێران و شەش هەزار ئەسیری گرت جگە لەپیاوە گەنجەکان.

مەهدی لەم ساڵەدا ڕیٚ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

فەرمانداری مەدینە محەممەد کوڕی ئیبراهیم بوو، فەرمانداری بەسرە حەسەن کوڕی زەید، میسر محەممەد کوڕی سەعید، یەمەن یەزید کوڕی مەنسور و بەوتەی دەستەیەك لەموسڵ ئیسماعیل کوڕی خالید کوڕی عەبدوالله کوڕی خالید فەرمانڕەوایەتی دەکرد.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: عوبەید کوڕی کچی باوکی لەیلا دادوەری کوفە کەشەریك کوڕی عەبدوالله‌ی نەخەعی لەجێگەی ئەو دانرا، هوشام کوڕی فاز کوڕی ڕەبیعەی جورەشی کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٥٩ کۆچی/ ٧٧٥ زایینی مرد، حەسەن کوڕی عەمارە، عەبدولرەحمان کوڕی عوسمان کوڕی عەبدوالله کوڕی خالید کوڕی حیزام لەمناڵەکانی برای حەکیم کوڕی حیزام و فیتر کوڕی خەلیفەی کوفی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و چواری کۆچی ( ٧٧١ زایینی )

لەم ساڵەدا مەنسور ڕۆشتە شام و بیت المقدس و یەزید کوڕی حاتەم کوڕی باوکی قەبیسە کوڕی موهەلیبی لەگەڵ پەنجا هەزار جەنگاوەر بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو خەواریجەی عومەر کوڕی حەفسیان کوشتبوو، ڕەوانەی ئەفریقییە کرد. مەنسور مەبەستی ئەوەی کرد شاری رافقە دروست بکات بەڵام خەڵکانی روقە ڕێگەی ئەم کارەیان لێگرت و مەنسور مەبەستی جەنگ لەگەڵ ئەوانی کرد (یا فەرمانی جەنگی دەرکرد)

هەروەها لەم ساڵەدا بەهۆی هەوربروسکە پێنج کەس لەمزگەوت کوژران.

لەم ساڵەدا باوکی ئەییووبی موریانی لەناوچوو و براکەی، یانی خالید ڕێگەی ئەوی گرتەبەر. مەنسور فەرمانیدا دەست و پێی برازاکانیشی ببڕنەوە.

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی زەبیانی نومەیری وەك فەرمانداری بەسرە دەستنیشان کرد. زەفەر کوڕی عاسمی هیلالی بۆ جەنگی هاوینە بەرێکەوت و فوراتی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشت.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم فەرمانداری مەککە ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

یەزید کوڕی حاتەم فەرمانداری ئەفریقییە و کارگوزارەکانی دیکە هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

ئەم کەسانە لەم ساڵەدا مردن: باوکی عەمرۆ کوڕی عەلا کەدەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٥٧ کۆچی/ ٧٧٤ زایینی مرد و ساڵەکانی تەمەنی هەشتاو شەش ساڵ درێژەی کێشا، محەممەد کوڕی عەبدوڵڵەی شوعەیسی نەسری، عوسمان کوڕی عەتا، ئەشعەبی تەماحکار، عەلی کوڕی ساڵحی حەبی، عومەر کوڕی ئیسحاق کوڕی یەسار، وەهیب کوڕی وێردی مەککی پارسا، قورە کوڕی خالید باوکی خالیدی سەدوسی بەسری، هوشامی دەستەوایی کەهەمان هوشام کوڕی باوکی عەبدوڵڵەی بەسرییە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و پێنجی کۆچی ( ٧٧٢ زایینی )

لەم ساڵەدا یە

زەید کوڕی حاتەم ڕۆشتە ناو ئەفریقییە و باوکی حاتەم و پاشای قەیرەوان و ڕۆژئاواییەکانی دیکەی کوشت. پێشتر ئاماژەمان بەجەنگ و چۆنیەتی کارەکانی ئەودا.

هەروەها لەم ساڵەدا، مەنسور، مەهدی بۆ دروست کردنی شاری رافیقە بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. ئەو، ئەو شارەی لەڕووی نەخشەی بەغدادەوە دروست کرد، بۆ کوفە و بەسرە سەنگەری هەڵکەند و دیوارەکانی بەرز کردەوە و هەموو خەرجییەکانی ئەم کارانەی خستە ئەستۆی خەڵکان. کاتێك مەنسور مەبەستی حەواندنەوەی ئەوانی کرد، بۆ هەمووان پێنج پێنج درەم مووچەی مانگانەی نووسی بەڵام کاتێك ژمارەی ئەوانی زانی، چل درەمی خستە ئەستۆی هەرکام لەوان و بەمشێوەیە باری سەرشانی خەڵکانی زیاد کرد. وتاردەرێك وتی:

یالقومی ما لقینا      من امیر المؤمنینا

قسم الخمسة فینا      وجبانا الاربعینا

واتاکەی: ئەی درێغ بۆ خەڵکەکەی من چوونکە لەدەست سەروەری باوەڕداران، چیمان نەکێشا و چەندە تاڵی و ئازارمان نەچێشت. موچەی مانگەی ئێمەی بەچوار درەم دیاری کرد بەڵام باجی چل درەمی خستە سەرشانمان.

هەروەها لەم ساڵەدا پاشای ڕۆم خوازیاری بەستنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ مەنسور بوو لەسەر ئەو بنەمایەی باجی پێبدات.

یەزید کوڕی ئوسیدی سولەمی لەهاویندا جەنگی کرد. عەبدولمەلیك کوڕی ئەییووب کوڕی زەبیان لەفەرمانداری بەسرە دوورخرایەوە و هەیسەم کوڕی معاویەی عەتەکی لەجێگەی ئەو دانرا.

## لابردنی عەبدوالله کوڕی محەممەد لەجەزیرە

**دانانی موسا کوڕی کەعب لەجەزیرە**

لەم ساڵەدا مەنسور، براکەی عەباس کوڕی محەممەدی لەفەرمانداری بەسرە دوورخستەوە و ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و دانی بڕێك سامانی وەك تاوان خستە ئەستۆی. بەردەوام ڕقی ئەوی لەدڵدا بوو تا ڕقی مامەکەی، ئیسماعیل کوڕی عەلی لەدڵ گرت. مامەکانی مەنسور لەبەرژەوەندی ئەو نێوەنجیگەرییان کرد تا ئەوەی لێی خۆشبوو. عیسا کوڕی موسا بەمەنسوری وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەبینم بنەماڵەی عەلی کوڕی عەبدوالله، هەرچەند لەبەخششەکانی تۆ کەڵك وەردەگرن، بەڵام بەردەوام ڕژدی بەئێمە دەبەن، یەك ئەوەی تۆ ڕۆژگارێکە ڕقی ئیسماعیل کوڕی عەلیت لەدڵ گرتووە و ئەوان ناچاریان کردی بیبەخشیت بەڵام هەنووکە بۆ ماوەیەکە ڕقی براکەتت لەدڵ گرتووە بەڵام کەسیان بۆ بەخشین و چاوپۆشین لەگوناحەکەی ئەو نەهاتۆتە لای تۆ. مەنسور ڕەزامەندی نیشاندا.

مەنسور، عەباسی بەدوای یەزید کوڕی ئوسید لەجەزیرە دانابوو. یەزید لەو سکاڵای بۆ لای مەنسور برد و وتی: ئەو سەبارەت بە دوورخستنەوەی من خراپەی هێناوەتە سەرزمان و ئابڕوو و ڕێزی منی نەهێشت. مەنسور پێی وت: چاکەکاری من وخراپەکاریم لەگەڵ ئەودا کۆبکەرەوە تا ببنە هاوسەنگی یەك. یەزید وتی: ئەگەر چاکەکاریتان پاداشی خراپەکاریتان بێت، فەرمانبەری ئێمە لەئێوە بەخششێکە لەئێمە بۆ ئێوە. کاتێك مەنسور براکەی لەجەزیرە لابرد، موسا کوڕی کەعبی وەك فەرمانداری ئەو سەرزەمینە دەستنیشان کرد.

## لەسەر کار لابردنی محەممەد کوڕی سلێمان لەفەرمانداری کوفە

**دانانی عەمرۆ کوڕی زوهەیر**

کاتێك مەنسور، محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی لەکوفە لابرد، عەمرۆ کوڕی زوهەیری زەببی برای موسەییبی زەبی وەك فەرماندار دیاری کرد. دەستەیەك دەڵێن: دوورخستنەوەی ئەو لەساڵی ١٥٣

کۆچی/ ٧٧٠ زایینی بوو. هۆکاری لەسەر کار لابرانەکەی ئەو هەواڵانە بوو بەردەوام بەمەنسور دەگەیشت. یەك ئەوەی کەعەبدکەریم کوڕی باوکی عەوەجای کوشتبوو چوونکە ئەوی بەتاوانی بێ دینی زیندانی کردبوو. ئەو خاڵی مەعن کوڕی زایدەی شەیبانی بوو. نێوەنجیگەران لەبەرژەوەندی ئەو لای مەنسور کۆبوونەوە. لەناو ئەوان تەنیا (فەنین) سەبارەت بەو قسەی کرد. مەنسور نامەی بۆ محەممەد کوڕی سلێمان نووسی و فەرمانی پێدا ئازادی بکات تا فەرمانی خۆی دەگات.

کوڕی باوکی عەوەجای پەیك و پەیامی بۆ محەممەد کوڕی سلێمان ناردبوو و داوای کردبوو مەرگی ئەو سێ ڕۆژ دوا بخات و ئەو، سەد هەزار درەمی پێ بدات. کاتێك ئەم وتەیان لای محەممەد کوڕی سلێمان باس کرد، فەرمانی سەربڕینی ئەویدا. کاتێك کوڕی باوکی عەوەجای لەمەرگی خۆی دڵنیا بوویەوە، وتی: سوێند بەخوا لەناو موسوڵمانان چوار هەزار حەدیسی درۆینەم بڵاو کردۆتەوە کەهەرکامیان ناڕەوایەکیان ڕەوا کرد و کارێکی ڕەوایان ناڕەوا کرد. سوێند بەخوا، ڕۆژەکانی ڕۆژوو بۆ خواردن ناچارم کردن و ڕۆژەکانی بێ ڕۆژوو، بۆ نەخواردن ناچارم کردن. بەڵێ، ئەویان سەربڕی.

نامەی مەنسور بە محەممەد گەیشت، نوسرا بوو: ئازادی بکە. نامەکە کاتێك گەیشت کەسەریان بڕیبوو. کاتێك مەنسور لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، توڕە بوو و وتی: سوێند بەخوا دەخوازم محەممەد کوڕی سلێمان لەتۆڵەی کوڕی باوکی عەوەجای بکوژم. عیسا کوڕی عەلی بانگ کرد و پێی وت: ئەمە کاری تۆ بوو، ئەم کوڕەت ناچار کرد بێ فەرمانی من خوێن بڕێژێت. فەرمانی لەسەر کار لابردنی ئەوم نووسیوە. ئەوی ترساند. عیسا پێی وت: محەممەد ئەوی لەسزای ناباوەڕیدا کوشتووە. ئەگەر کارێکی ڕاستی ئەنجام داوە، لەبەرژەوەندی تۆدایە و ئەگەر کارەکەی نەشیاوە، گوناحەکەی لەئەستۆی خۆیدایە. ئەگەر لەسەر ئەم کارە، ئەو لەسەر کار لابەریت، بێ گومان ناوی چاکەی ئەو دەکەوێتە سەر زاران و وتارە نەشیاوە و قێزەونەکان سەبارەت بەتۆ بڵاو دەبێتەوە. مەنسور نامەکەی دڕاند.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا خەواریجی سەفەری دین، نیشتەجێی سێجلماسە، کارەکانی عیسا کوڕی جەریریان سەرکۆنە کرد. ئەویان گرت و زیندانییان کرد و لەبەرزاییەکانی کوفە دایاننا تا گیانی دەرچوو. باوکی قاسمی سەمەکو کوڕی واسوولی مێکناسی باوەگەوڕێی (مدرار)یان وەك پێشەوای خۆیان هەڵبژارد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەید کوڕی حەسەن کوڕی کوڕی عەلیان لەفەرمانداری مەدینە لابرد و مامەکەی، عەبدسەمەد کوڕی عەلی فەرمانداری تاییف و مەککەیان لەجێگەی ئەو دانا. فەرمانداری کوفە عەمرۆ کوڕی زوهەیر بوو، فەرمانداری بەسرە، هەیسەم کوڕی معاویە، فەرمانداری میسر محەممەد کوڕی سەعید و فەرمانداری ئەفریقییە یەزید کوڕی حاتەم، فەرمانداری موسڵ خالید کوڕی بەرمەك یا موسا کوڕی کەعب کوڕی سوفیانی خەسعەمی بوو.

لەم ساڵەدا، مێسعەر کوڕی کێدامی کوفی هیلالی مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و شەشی کۆچی (٧٧٣ زایینی)

## شۆڕشی خەڵکانی سیوەیل لەبەرابەر عەبدولڕەحمانی ئومەوی

لەم ساڵەدا عەبدولڕەحمانی ئومەوی پاشای ئاندۆلۆس بۆ جەنگی شەقنا بەڕێکەوت و مەبەستی قەڵای سیتەرانی کرد و گەمارۆی خستەسەر. بارودۆخی لەخەڵکەکەی دژوار کرد و ئەو، بەهەمان شێوەی خۆی، رووی کردە دەشت و بیابان و کوێستان. کوڕەکەی خۆی یانی سلێمانی وەك جێگر لەکوردوا دانا بوو. نامەی ئەوی بەدەست گەیشت، نووسیبووی: خەڵکانی سیوەیل بەسەرکردایەتی عەبدغەفار و حەیوەت کوڕی مولابیسْ نافەرمانی فەرمانەکانم دەکەن و دژی من ئالآی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. یەمانییەکانی ئەم سەرزەمینە پەیوەستیان بوون. عەبدولڕەحمان گەڕایەوە بەڵام نەڕۆشتە ناو کوردوا. ئەوەی لەزۆری ژمارەی ئەوان و هاوپەیمانی ئەوان بیستی، ترسی تیا دروست کرد. کوڕە مامەکەی یانی عەبدولمەلیك کوڕی عومەری وەك فەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی ڕەوانە کرد. ئەو (هەورە بروسەکەی بنەماڵەی مەڕونان) بوو. عەبدولڕەحمان لەپشتەوەی گۆڕەپانی جەنگ وەك پشتیوانی ئەو مایەوە.

کاتێك عەبدولمەلیك لەخەڵکانی سیوەیل نزیك بوویەوە، کوڕەکەی ئومەییەی بۆ پێشەوە نارد و لەبارودۆخی ئەوان ئاگادار بوویەوە. ئەوانی بەبێدار و وشیار بینی. باوکی لەسستی و لاوازی ئەو تووڕە بوو و فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد. کەسان و بنەماڵەکەی خۆی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن: ئێمەیان لەرۆژهەلآت زەوی بۆ دوورترین شوێنی جیهان لەئاوەدانی و سەوزی و بەخشش و هەرزانی دوور خستۆتەوە و هەنووکە بۆ ئەم پارووە نانەی هەمانە و بەهۆیەوە دەتوانین درێژە بەژیان دەدەین، رژدیمان پێ دەبەن و ڕێگە نادەن بەئاسوودەی ئاو لەقوڕگمان بڕواتە خوار. کالآنی شمشێرەکانتان بشکێنن و پیاوانە بجەنگن چوونکە مردن باشترە لەوەی نەخوازن سەرکەوتن بەدەست بێنن.

ئەو کارەیان کرد و یەمانییەکان و خەڵکانی سیوەیل شکستیان خوارد و دوای

یەمانییەکان، نەیانتوانی هیچ کارێك بکەن. عەبدولمەلیك بریندار بوو.

ئەم هەواڵە بە عەبدولرەحمان گەیشت. ڕۆشتە لای، برینەکەی خوێنی لێ دەباری و شمشێرەکەی خوێنی لێ دەچۆڕا، دەستی بەدەسکی شمشێرەکەیەوە لکا بوو. ناوچاوانی ماچ کرد و وتی: کوڕی مام، فلان کچی تۆم بۆ هاوسەری کوڕەکەم و جێگری خۆم هەڵبژاردووە و مارەیی ئەوم بەمشێوەیە دیاریکردووە، بەوشێوەیە بەخششەکانی خۆم بەتۆ و منالەکانت بەخشی و زەوییە بەربلاوەکانم کردە جێگەی ئێوە و ئێوەم وەك وەزیر و راوێژکارەکانی خۆم هەڵبژارد.

ئەمە ئەو عەبدولمەلیکە بوو عەبدولرەحمانی ناچار بەلابردنی ناوی مەنسور لەخوتبەی نوێژی هەینی کرد و پێی وت: یا ناوی ئەو نابەیت یا خۆم دەکوژم.، ئەو دەمانگ ناوی مەنسوری لەخوتبەکانیدا دەهێنایە سەرزمان و چیتر ئەو کارەی نەکرد.

عەبدغەفار و حەیوەت کوڕی مولابیس لەکوژران رزگارییان بوو. کاتێك ساڵەکانی ١٥٧ کۆچی /٧٧٤ زایینی، نزیك بوونەوە، عەبدولرەحمان رووی کردە سیوەیل و خەڵکانێکی زۆری لەو کەسانەی شوێنکەوتەی عەبدغەفار و حەیوەت بوون، کوشتار کرد و گەڕایەوە. بەهۆی ئەم کارەوە و دەغەڵکاری عەرەبەکان، عەبدولرەحمان دەستی بەکۆکردنەوە و هەڵبژاردنی کۆیلەکان کرد.

## ئاژاوە لەئەفریقییە لەگەڵ خەواریج

پێشتر، بەسەرهاتی هەڵاتنی عەبدولرەحمان کوڕی حەبیبمان باس کرد کەباوکی فەرمانداری ئەفریقییە و لەنێوان و ئەو خەواریج چی روویدا. ئەو رووی کردە کوتامە و یەزید کوڕی حاتەم فەرمانڕەوای ئەفریقییە، سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و لەگەڵ خەڵکانی کوتامە جەنگان.

لەم ساڵەدا، یەزید سوپایەکی دیکەی بۆ هاوکاری ئەو کەسانە ڕەوانە کرد کەدژی عەبدولرەحمان دەجەنگان. بازنەی گەمارۆ، گوشاری خستە سەر و هەڵات و لەشوێنەکەی خۆی دوور کەوتەوە. جەنگاوەران شوێنی نەکەوتن.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی یەحیا کوڕی فانوسی هەواری لەپانتاییەکانی تریپۆلی (تەرابلۆس) ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستەیەکی فراوان لەبەربەرییەکان لەدەوری کۆبوونەوە. لەوێ، سوپایەکی یەزید کوڕی حاتەم کارگوزاری شارەکە بوو. کارگوزار لەگەڵ سوپاکەی هاتەدەر. لەسەر کەنارەکانی دەریا لەسەرزەمینی هەوات رووبەرووی یەك بوونەوە و جەنگان. باوکی یەحیا کوڕی فانوس شکستی خوارد و زۆرینەی سوپاکەی کوشتار کران. بەمشێوەیە خەڵکان لەئەفریقییە ئاسوودە بوون و بارودۆخی ئەو سەرزەمینە بۆ یەزید کوڕی حاتەم سەقامگیر بوو.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا زەفەر کوڕی هەیسەم کوڕی معاویە فەرمانداری بەسرە، دەستی بەعەمرۆ کوڕی شەداد گەیشت. ئەو کارگوزاری ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله لەفارس بوو. هۆکاری دەست گرتنەکەی ئەوە بوو: ئەو، لەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆیدا. کۆیلە رێگەی گرتنی ئەوی نیشاندا کەگرتی و کوشتی و لەمێربد لەداریدا.

هەروەها لەم ساڵەدا، هەیسەمیان لەفەرمانداری بەسرە دوورخستەوە: سەواری

فریاڕەسیان وەك پێشنوێژ و سەرپەرەستی دامەزراوەی داد دەستینشان کرد و سەعید کوڕی دەعلەجیان وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی شارەکە و ڕووداوەکان دانا. کاتێك هەیسەم گەیشتە بەغداد، مرد و مەنسور نوێژی لەسەر خوێند.

زەفەر کوڕی عاسمی هیلالی جەنگی هاوینەی کرد، عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزاری مەککە محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ڕێبەر بوو، دەعلەج کوڕی زوهەیر، پێشنوێژی گشتی و سەرپەرەستی دامەزراوەی داد سەوار کوڕی عەبدوالله، کارگوزاری ناوچەکانی فارس و ئەهواز و دیجلە، عومارە کوڕی حەمزە، کارگوزاریس کرمان و سیند هوشام کوڕی عەمرۆ، کارگوزاری ئەفریقییە یەزید کوڕی حاتەم و کارگوزاری میسر محەممەد کوڕی سەعید بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی، ڕقی کۆیلەکەی (بەدر) لەدڵ گرت چوونکە زیاد لەرادە تێکەڵاو و ڕێز کۆڕ و دانیشتنەکانی نەدەگرت و ژێر دەستی گەورەکەی بەسووکایەتی لەقەڵەم دەدا. عەبدولرەحمان ڕێزی لەچاکەکاری و کۆیلایەتی ئەو نەگرت، دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت و بەخششەکانی لەو گرتەوە و ئەوی بۆ سنوور دوورخستەوە. لەو سەرزەمینە مایەوە تا ئەو کاتەی بەیەکجاری کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی زیادی ئەنعەم سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەفریقییە مرد. خەڵکان سەبارەت بەگێڕانەوەکانی ئەو گومانیان هەبوو. حەمزە کوڕی حەبیبی زەییات (قورئان خوێن و فێرخوازی قروئان) یەکێك لەحەوت قورئان خوێنەکە، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و حەوتی کۆچی ( ٧٧٤ زایینی )

لەم ساڵەدا مەنسور کۆشکێکی بەناوی (جاودانە) بۆ خۆی دروست کرد.

هەروەها مەنسور لەم ساڵەدا فەرمانیدا بازارەکان بۆ گەڕەکی کەرخ و شوێنەکانی دیکە بگوێزنەوە.

هۆکاری ئەم بڕیارەمان پێشتر باس کرد. ئەو سەعید کوڕی دەعلەجی وەك فەرمانداری بەحرەین دانا کەکوڕەکەی خۆی یانی تەمیمی پێش خۆی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. مەنسور بەناو سوپا تەیار و ئامادەکەی خۆیدا گەڕا. لەو کاتەدا زرێیەکی پۆشیبوو و خودەی لەسەردا بوو.

لەم ساڵەدا عامر کوڕی ئیسماعیلی موسەلا کۆچی دوایی کرد و مەنسور نوێژی لەسەر خوێند. سەوار کوڕی عەبدوالله سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە کۆچی دوایی کرد و لەجیاتی ئەو، عوبەیدالله کوڕی حەسەن کوڕی حوسەینی عەنبەرییان دانا. محەممەد کوڕی سلێمانی کاتبیان لەفەرمانداری میسر لابرد و کۆیلەکەی، یانی مەتریان لەجێگەی ئەو دانا. مەعبەد کوڕی خەلیل وەك فەرمانداری شاری سێند دیاریکرابوو و هوشام کوڕی عەمرۆ لەسەر کار دوورخرابوویەوە.

یەزید کوڕی ئوسیدی سولەمی جەنگی هاوینەی کرد و سەنان موالی بەتاڵی بۆ قەلاکە ڕەوانە کرد. بەتاڵ ئەسیر و گرفتاری زۆری لەگەڵ خۆی هێنا. دەستەیەك دەڵێن: زەفەر کوڕی عاسم جەنگی هاوینەی کرد.

ئیبراهیم کوڕی یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس فەرمانداری مەککە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. دەستەیەك دەڵێن: فەرمانداری مەککە عەبد سەمەد کوڕی عەلی بوو. کارگوزاری شارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشتر بوون.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدوەهاب کوڕی ئیبراهیمی ڕێبەر کۆچی دوایی کرد و دەستەیەك دەڵێن: لەساڵی ١٥٨ کۆچی/ ٧٧٥ زایینی مرد، ئەوزاعی فەقیهی ناودار

کەناوی عەبدولرەحمان کوڕی عەمرۆ بوو لەتەمەنی حەفتا ساڵی مرد، مەسعەب کوڕی سابت کوڕی عەبدوالله کوڕی زوبەیر کوڕی عەوام باوەگەوڕێی زوبەیر کوڕی بەکار.

لەم ساڵەدا گارلە پاشای فەرەنگەکان، سلێمان کوڕی یەقزانی لەسەرزەمینە ئیسلامییەکان دەرپەڕاند. ئەو لەئاندۆلۆس ژیانی بەسەر دەبرد. ئەوی لەرێگەدا بینی و تا ساراگوسا هاورێیەتی کرد. حسەین کوڕی یەحیا ئەنساری لەبنەماڵەی سەعد کوڕی عوبادە، پێشی کەوتەوە و لەقەلاْکەدا سەنگەری گرت. گارلە، پاشای فەرەنگەکان، گوناحی ئەم کارەی خستە ئەستۆی سلێمان و وتی: تۆ بەشێوەیەکی نهێنی بۆ ئەم کارە ناچارت کردووە، ئەوی گرت و لەگەڵ خۆی بۆ وڵاتەکەی خۆی برد. کاتێك لەسەرزەمینە ئیسلامییەکان دوور دەکەوتەوە و ئارامی دەگرت، مەتروح و عەیشون، کوڕەکانی سلێمان لەگەڵ هاوەڵەکانیان هێرشیان کردنەسەر و باوکیان رزگار کرد و ئەویان بۆ ساراگوسا گەڕاندەوە و لەگەڵ حسەین ڕۆشتنە ناو شارەکە و بۆ شەڕ دژی عەبدولرەحمان یەکیانگرت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و هەشتی کۆچی ( ٧٧٤ زایینی )

## دوورخستنەوەی موسا لەفەرمانداری و هاتنە سەرکاری خالید کوڕی بەرمەك

لەم ساڵەدا مەنسور، موسا کوڕی کەعبی لەفەرمانداری موسڵ دوورخستەوە، چوونکە ئەو هەواڵانەی لەکارەکانی ئەو بیستبووی، توڕەیی ئەوی لێکەوتەوە. فەرمانی بەمەهدی کوڕیدا بەرەو ڕەقە بەڕێکەوێت، خۆیشی واینیشاندا مەبەستی ڕۆشتن بۆ بیت المقدسی لەسەردایە. فەرمانی بەکوڕەکەیدا بوو ڕێگەکەی بەشێوەیەك هەڵبژێرێت لەموسڵەوە گوزەر بکات و کاتێك گەیشتە ئەو شارە، موسا بگرێت و زیندانی بکات و خالید کوڕی بەرمەك لەجیاتی ئەو وەك فەرمانڕەوا دابنێت.

مەنسور، خالید کوڕی بەرمەکی بەپێدانی سێ هەزار هەزار (ملیۆن) درهەم ناچار کردبوو. ماوەی سێ ڕۆژی بۆ دانابوو تا پارەکە بداتەوە یا بکوژرێت. خالید بەیەحیای کوڕی وت: کوڕی خۆم! بڕۆ لای براکانمان عومار کوڕی حەمزە، موبارەکی تورکی و ساڵح پێشنوێژی مزگەوتەکە و کەسانی دیکە و لەباروودۆخی خۆمان ئاگاداریان بکەرەوە.

یەحیا دەڵێت: ڕۆشتمە لای ئەوان، دەستەیەکیان لەبینینی من خۆیان دوورخستەوە بەڵام پارەکەیان نارد. دەستەیەکیان بەرووگرژی سەیری منیان کرد بەڵام بەشێوەیەکی شاراوە پارەکەیان ڕەوانە کرد. یەحیا دەڵێت: ڕۆشتمە لای عومار کوڕی حەمزە، سەیری دیوارەکەی دەکرد، ئاوڕی دایەوە و سڵاوم لێکرد. بەشێوەیەکی سارد وەڵامی دامەوە. پرسی: باوکت چۆنە؟ لەپێشهاتەکان ئاگادارم کردەوە و داوای سەد هەزار درهەمم کرد. وتی: ئەگەر دەمتوانی، دەمنارد. گەڕامەوە لەکاتێکدا بۆ نفرینی لەخۆبایی بوونی ئەوم دەکرد. وتەکانی ئەوم بۆ باوکم گێڕایەوە کەلەناکاو پارەکە لەلایەن عومارەوە گەیشت. یەحیا دەڵێت: ئێمە لەماوەی دوو ڕۆژ دوو هەزار هەزار و حەوتسەد هەزار درهەممان کۆکردەوە و تەنیا

سێسەد هەزار درەمی مابوو کەئەگەر کۆنەدەکرایەوە، ریسەکەمان دەبوو بەخوری.

یەحیا دەڵێت: ئەو رۆژە خەمبار لەپردەکە گوزەرم کرد، کەسێك لەناکاو هاتە سەرریێگەم و وتی: هەواڵێکی خۆشم پێیە. پشتم تێکرد بەلاّم دووبارە لەمن نزیك کەوتەوە، جڵەوی ئەسپەکەی گرتم و وتی: تۆ خەمباریت، سوێند بەخوا بەیانی شادمان دەبیت و لەکاتێکدا لەم پردە گوزەر دەکەیت، ئالاّی حکومەت لەبەردەم تۆدا هەڵکراوە. لەم وتەی ئەو سەرمسوڕما. ئەو پیاوە وتی: ئەگەر وتەکەی من راست بوو، دەبێت پێنج هەزار درەمم پێ بدەیت. منیش بەسەرسوڕمانەوە بەڵێنم پێدا.

بەمشێوە بوو هەواڵی شۆڕشی خەڵکانی موسڵ و جەزیرە و زاڵبوونی کوردەکان لەو ناوچانە بەمەنسور گەیشت. مەنسور پرسی: چ کەسێك شیاوی فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیە؟ موسەییب کوڕی زوهەیر وتی: بۆچوونێکم هەیە هەرچەند دڵنیام پێی رازی نابیت و گرنگی پێنادەیت بەلاّم دەست لەچاکەخوازی تۆ هەڵناگرم. مەنسور وتی: بدوێ. وتی: کەس وەك خالید کوڕی بەرمەك شیاوی فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینە نییە. مەنسور وتی: دوای ئەو هەموو ئازارەی بەسەر ئەودا سەپاندمان، چۆن ئەم ئەندێشەیە ڕەوایە؟ موسەییب وتی: تۆخۆت بواری ئەم کارەت رەخساندووە و من دەبمە دەستبەری ئەو. مەنسور وتی: بەیانی بیهێننە لای من. بەیانی ئەو رۆژە خالیدیان بردە لای مەنسور و ئەو لەسێسەد هەزار درەمەکەی دیکە، چاوپۆشی کرد و بۆ خۆی و یەحیای کوڕی ئالاّی فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجانی هەڵکرد. یەحیا چاوی بەو پیاوە کەوت کەهەواڵەکەی پێدابوو. ئەو پیاوەی کردە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆی و پەنجا هەزار درەم مژدانەی پێبەخشی. خالید ئەو سێسەد هەزار درەمی لەعومارەی وەرگرتبوو، بەنێوەنجیگەری یەحیای کوڕی، بۆ عومارەی گەڕاندەوە و پەیامی بۆ نارد: مەگەر من سەڕاف باوکت بووم؟ چیتر خۆت لەمن دوور بخەرەوە. بەلاّم عومارە پارەکەی گەڕاندەوە.

خالید بەهاوڕێیەتی مەهدی بەرەو موسڵ بەرێکەوت و موسا کوڕی کەعبی لەو سەرزەمینە لەسەر کار لابرد و خۆی و کوڕەکەی فەرمانداریيان گرتەدەست.

خالید فەرمانڕەوایەتی موسڵ و یەحیای کوڕی فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجانی دەکرد تا ئەوەی مەنسور مرد. ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی سەواری موسڵی دەڵێت: ئێمە هیچ کات سەرکردەیەکی گەورەی وەك خالیدمان نەبووە و کەس وەك ئەو لای ئێمە ڕێزدار نەبووە، ئەم ڕێزدارییە لەسەختگیرییەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، بەڵکو لەدڵی ئێمەدا ڕەگی داکوتابوو.

## مردنی مەنسور و وەسیەتی ئەو

لەم ساڵەدا مەنسور لەشەشی زیحەججە /٢٨ ژوئەنی ٧٧٩ زایینی لەبئر مەیمون مرد. وتراوە وەحی بەشێوەیەکی نهێنی لەکۆشکەکەی ئەودا هاواری کردووە و ئەو، دەنگەکەی بیستووە کەهۆنراوەیەکی بەمشێوەی هێناوەتە سەرزمان:

| | |
|---|---|
| اما و رب السكون و الحرك | ان المنايا كثيرة الشرك |
| عليك يا نفس، ان اسأت و ان | احسنت بالقصد كل ذاك لك |
| ما اختلف اليل و النهار و لا | دارت نجوم السمأ فى الفلك |
| الا تنقل السلطان عن ملك | اذا انتهى ملكه الى ملك |
| حتى يصيرا به الى ملك | ما عز سلطانه بمشترك |
| ذاك بديع السمأ و الارض و الـ | مرسى الجبال المسخر الفلك |

واتاکەی: سوێند بەخوای ئارامی و جووڵە، مەرگ چەندین داوی هەیە، ئەی گیان! لەسەر تۆیە میانەڕەوی لەچاك و خراپە بەجێ بێنی، چوونکە ئەوە هەموو شتێك دەبێت بۆ تۆ. شەو و بەیانی یەك لەدوای یەك نەدەهاتن و ئەستێرەکان لەگەردوونەدا نەدەسوڕانەوە مەگەر ئەوەی فەرمانڕەوایی لەشوێنێك بەکۆتایی دەگەیشت و شوێنەکەی بەکەسێکی دیکە دەسپارد. تا ئەو جێگەی (شەو و ڕۆژ) ئەو بۆ دەرگای فەرمانڕەوایەك بنێرن کەرێزداری فەرمانڕەواکەی، هاوتای نییە. ئەو بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی و کێوەکان و گەردوونەی ئاسمانە.

مەنسور وتی: کاتی مەرگی من هاتووە. تەبەری دەڵێت: عەبدولعەزیز کوڕی موسلیم وتی: ڕۆژێك ڕۆشتمە لای مەنسور و سڵاوم بۆ نارد. بەشێوەیەك گێژ و

پەرێشان بوو وەڵامی نەدامەوە. ئەوەی بینیم هانیدام بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە. دوای چەند ساتێك مەنسور پێی وتم: لەخەودا بینیم وەك بڵێی کەسێك ئەم هۆنراوانە بۆ من دەهۆنێتەوە:

أأخي خفض من مناكا فكأن يومك قدأتاكا

و لقد اراك الدهر من تصريفه ما قد اراكا

فاذا اردت الناقص العبـ ـدالذليل فأنت ذاكا

ملكت ما ملكته و الامر فيه الى سواكا

واتاکەی: براکەم! لەئارەزووەکانی خۆت کەم بکەرەوە وەك بڵێی ڕۆژی مەرگی تۆ هاتووە، و ڕۆژگار، سووڕانەکانی خۆی نیشانی تۆداوە، ئەگەر بخوازیت بەندەیەکی ریسوا و زەلیل ببینیت، تۆخۆت، ئەو کەسەیت. ئەوەی دەبوا، بەدەستت هێنا، بەڵام ئەوەی هەتە بۆ کەسێکی دیکە دەبێت.

پەرێشانی و خەمی من بۆ ئەو بابەتەیە کەبینیم و بیستم. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوەی بینیوتە، خێر و خۆشییە.

دوای ماوەیەکی زەمەنی کەم بەرەو مەککە بەرێکەوت. کاتێك لەبەغدادەوە بەرەو مەککە دەڕۆشت، لەکۆشکی عەبدوویە دابەزی و لەهەمان شوێن لەسێی شەوال/ پێنجی ئوتی ٧٧٥ زایینی، ئەستێرەکە لەبەرەبەیان بۆ ئەو هەلآت و نیشانەکانی تا دەرکەوتنی هەتاو، بەئاسمانەوە دیار بوو. ئەو مەهدی بانگ کرد تاماڵئاوایی لێبکات. مەنسور بۆ سامان و خەلافەتەکەی ئەوی کردە جێگری خۆی. لەبەیانی و ئێواریٚ و هەموو ئەو ساتانەی لەو شوێنە بوو، وتەکانی خۆی دووبارە دەکردەوە و سەرئەنجام لەدووایین ڕۆژ بەمەهدی وت: هیچ شتێکم پشتگوێ نەخستووە مەگەر ئەوەی تۆم لیٚ ئاگادار کردبێتەوە و هەنووکە پێشنیاری کارە چاکەکانت پیٚ دەکەم کەگومان ناکەم یەکێك لەوان بێنیتەدی.

مەنسور سنووقێکی بوو کەدەفتەرەکانی خۆی تیا هەڵدەگرت، قوفڵی کردبوو و کەس جگە لەخۆی نەیدەتوانی بیکاتەوە. مەنسور رووی کردە مەهدی و وتی: سەیری ئەم سنووقە بکەو بیپارێزە چوونکە زانستی هەموو پێشینانت تا دووایین ڕۆژ لەو سنووقەدا دانراوە. ئەگەر بابەتێك خەمباری کردی، سەیری ئەو دەفتەرە

بکە، ئەگەر بەمەبەستەکەی خۆت گەشتیت باشتر و گەرنە سەیری دەفتەری دووەم و سێیەم تا حەوتەم بکە، ئەگەر ئەم کارە لای تۆ دژوار بوو، دەفتەرێکی بچووکی تێدایە و ئەوەی بخوازیت، لەوێدا بەدەستی دێنیت، بەلاّم گومان ناکەم ئەو کارە بکەیت.

جوان سەیری ئەم شارە (بەغداد) بکە و هیچ شارێکی دیکە مەکە جێگری ئەو شارە چوونکە سامانێکم لەو شارەدا بۆ تۆ کۆکردۆتەوە کەئەگەر دەساڵ باج بەتۆ نەگات، دەتوانی خەرجی سوپاییەکان، خەرجییەکانی دیکە، خەرجی منالّ و منالّی منالّەکانت بدەیت، کەواتە بیپارێزە چوونکە تا ئەو کاتەی گەنجخانەکەی تۆ ئاوەدانە، کەسێکی رێزداریت بەلاّم گومان ناکەم ئەو کارە بکەیت.

پێشنیارت پێدەکەم رێز لەکەسانی بنەماڵەکەت بگری و چاکەیان لەگەڵ بکەیت و ئەوان لەکاروبارەکان پێش بخەیت، قاچی ئەوان بخەیتە سەر سەری خەڵکان و لەسەر مینبەر جێگەیان بۆ بکەیتەوە چوونکە رێزی تۆ رێزی ئەوانە و لەبیر نەکردنی ئەوان لەبەرژەوەندی تۆدایە، بەلاّم گومان ناکەم ئەو کارە بکەیت.

سەیری کەسانی نزیك و موالییەکانت بکە و بۆ ئەوان کەسێکی چاکەکار بە، ئەوان پێش بخە و ژمارەیان فراوان بکە چوونکە لەکاتی پێشهاتە ناسازگارەکان پشتیوانی تۆ دەبن بەلاّم گومان ناکەم ئەو کارە بکەیت.

پێشنیارت پێدەکەم چاکە لەگەڵ خەڵکانی خوراسان بکەیت چوونکە ئەوان هاوەڵاّن و شوێنکەوتەکانی تۆن و لەماڵ و گیانی خۆیان بۆ فەرمانڕەوایەتی تۆ درێغیان نەکرد. چاکە لەگەڵ ئەو کەسانە بکە کەخۆشەویستی تۆیان لەدڵ دەرناچێت و لەگوناحەکانیان خۆش ببە و بۆ کارەکانیان پاداشتیان پێ ببەخشە. ئەگەر کەسێك لەوان مرد، جێگەی خاڵی ئەو لەناو بنەماڵەکەی پڕ بکەرەوە بەلاّم گومان ناکەم ئەو کارە بکەیت.

هەرگیز لەرۆژهەلاّت بناغەی شارێك دامەرێژە چوونکە ناتوانی دروست کردنەکەی بەئەنجام بگەیێنیت بەلاّم گومان دەکەم ئەو کارە دەکەیت.

ئاگادار بە لەمناڵەکانی سولەیم داوای هاوکاری نەکەیت بەلاّم گومان دەکەم ئەو کارە بکەیت.

ئاگادار بە ژنان لەکاروبارەکان دوور بخەیتەوە بەڵام گومان دەکەم ئەو کارە بکەیت.

دەڵێن: مەنسور وتی: لەزیئەلحەججە لەدایك بووم و لەم مانگەدا فەرمانڕەوایەتیم گرتەدەست و لەم مانگەدا کۆچی دوایی دەکەم و ئەم بابەتە بۆ حەج کردن هانیدام. لەپێشنیارەکانی منە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری موسوڵمانان – لەدوای مەرگم– بیری خواوەندت بێت تا خەم و پەژارەکانی تۆ بۆ شادمانی و کامەرانی بگۆڕێت و لەو شوێنەوەی گومان ناکەیت، دەرگای ڕەحمەتی خۆی بەرووی تۆدا بکاتەوە.

کوڕی خۆم، محەممەد! لەناو ئۆمەتەکەی بەزیندوویی بهێڵەرەوە تا خواوەند تۆ و فەرمانڕەوایەتییەکەت بپارێزێت. ئاگادار بە بەناڕەوا خوێنی کەس نەڕژێنیت چوونکە لای خواوەند گوناحێکی گەورەیە و نەنگێکی هەمیشەییە بۆ دنیا.

سنوورە خواییەکان مەبەزێنە چوونکە رزگاری تۆ لەم دنیا و مانەوەت لەبەهەشت بەندە بەو کارە، سنوورەکان مەبەزێنە بۆ ئەوەی لەناو نەچیت، ئەگەر خواوەند شتێکی باشتری دەزانی کەبۆ دینەکەی شیاوتر و گونجاوتر بێت، دڵنیابە لەکتێبەکەی خۆیدا باسی دەکرد.

بزانە خواوەند لەفراوانی توڕەیی و غەزەبی خۆی بۆ ڕێزگرتن لەزاڵبوونی لەکتێبەکەی خۆیدا فەرموویەتی سزای ئەو کەسەی کارە ناڕەواکان لەسەر زەوی ئەنجام دەدات، بەوشێوە و بەم شێوەیە لەگەڵ ئەو سزا و ئازابە گەورەی لەو دنیا چاوەڕوانی دەکات. خواوەند لەکتێبەکەی خۆیدا دەفەرمێت: سزای ئەو کەسانەی دژایەتی خواوەند و پێغەمبەر (د.خ) دەکەن و کارە ناڕەواکان لەسەر زەوی ئەنجام دەدەن، ئەوەیە بەکوژراوی لەخاچ بدرێن.

کوڕی خۆم! فەرمانڕەوایی، تەناڤ بەهێزی خواوەند و دەستاوێزێکی نەشیاو بۆ پچڕان و ئایینی ڕاستی ئەوە، کەواتە ڕێزی بگرە و بیپارێزە و بەرگری لێبکە. خواوەند! ناباوەڕان سزا و هەڵگەڕاوەکان سەرکوت و کەیفەری خەواریج بدە، لەفەرمانەکانی خوت چاو مەپۆشە، دادپەروەری بکەرە پیشە و سنوورەکان بپارێزەی چوونکە ئەم کارە زیاتر لەهەر شتێکی دیکە دەبێتە هۆی ڕێگری

لەدروست بوونی دوژمن و نەیارەکانی تۆ لەناو دەبات و چارەسەرێکی گونجاوە. لەوەی پەیوەندی بەتالآنییەکانەوە هەیە، لەلارێدا مەڕۆ، چوونکە بەوەی خواوەند بەتۆی بەخشیوە، پێویستت بەتالآنییەکان نییە. فەرمانڕەوایی بەرێزگرتن لەکەسانی نزیك دەست پێبکە. لەخۆپەسەندی و بەفیڕۆدانی سامانەکان خۆت بەدوور بگرە و سنوور پارێزەکان بۆ سنوورەکان ڕەوانە بکە. ڕێگەکان ئەمن و ئاسوودەی بەهەمووان ببەخشە. چارەسەری کێشەکانیان بکە و ناخۆشییەکانیان لیٚ دوور بخەرەوە. سامانەکان بەدەست بێنە و پاشەکەوتیان بکە و لەزێدەڕۆیی خۆت بەدوور بگرە چوونکە لەبەلاٚ و زیانەکانی ڕۆژگار پارێزراو نیت.

تا ئەو جێگەی دەتوانی چوارپیٚ و پیاو و سوپا کۆبکەرەوە، کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی چوونکە کارەکان کەڵەکە دەبن و لەکاتی ساماندانی کاروبارەکان، فیڕۆیی و گەندەڵی دێتە ئاراوە. هەوڵ بدە ئەو پێشهاتانەی رووبەروت دەبنەوە، لەکاتی خۆیدا جێبەجێیان بکەیت. پیاوەکان لەشەودا ئامادە بکە بۆ ئەوەی بزانی لەرۆژدا چی روودەدات بەهەمان شێوە پیاوان لەرۆژدا ئامادە بکە تا بزانی لەشەودا چی روودەدات. خۆت، جڵەوی کاروبارەکان بگرە دەست بیٚ ئەوەی سستی نیشان بدەیت. بەخواوەند خۆشبین بە و لەکارگوزار و دەبیرەکانی خۆت بەد گومان. وشیار و بێدار بە، دڵنەوایی ئەوکەسانە بکە لەبەر دەرگایماڵەکەی تۆ چاوەڕوانن. بەئاسانی مۆڵەتی هاتنە ژوور بەخەڵکان بدە، لێکۆڵینەوە لەکاروباری ئەو کەسانە بکە دادخوازی دەهێننە لای تۆ، کەسێك بۆ کارەکانی ئەوان راسپێرە کەهیچ کات خەو نەیباتەوە و سەرقاڵی نەکات. هەرگیز بیٚ ئاگایانە مەخەوە چوونکە باوکت هەرگیز بەو شێوە نەخەوتووە و چاوی نەخستۆتە سەریەك مەگەر ئەوەی دڵی بەئاگا بووە. ئەمە وەسیەت نامەی منە بۆ تۆ. خواوەند شایەتی نێوان من و تۆیە. دواتر ماڵئاوایی لێکرد و یەکتریان لەئامێز گرت و دەستیان بەگریان کرد.

ئەو بەرەو کوفە بەرێکەوت و حەج و عەمرەی کرد. قوربانییەکانی لەپێشەوە نارد و قوربانییەکەی خۆی بەداماڵینی پێستەکەی نیشاندا. ئەمە لەکاتێکدا بوو چەند رۆژێك لەزی قەعدە/ سێپتامبەری ٧٧٥ زایینی تێدەپەڕی. کاتێك چەند مەنزڵێك لەکوفەی بڕی، ئازارێك سەرتاپای جەستەی داگرت و بووە هۆکاری

مردنی. کاتێك ئازارەکەی تەشەنەی سەند، بەرەبیعی وت: بۆ حەرەمی خواوەندم ببە بۆ ئەوەی لەگوناحەکانم هەڵبێم. رەبیع جڵەوداری ئەسپەکەی بوو. مەنسور پێشنیارەکانی خۆی پێکرد. کاتێك بەرەبەیانی رۆژی شەشەم گەیشتە بئر مەیمون، لەویٚ مرد لەکاتێکدا لەکاتی مەرگ جگە لەرەبیع و خزمەتکارەکانی کەسی دیکەی لەگەڵدا نەبوو. رەبیع مردنی ئەوی شاردەوە و رێگەی نەدا کەس لەسەر جەنازەکەی بگری تا ئەو کاتەی هەتاو هەلآت. لەم کاتەدا وەك هەمیشە بنەماڵەکەی ئامادە بوون. یەکەم کەس کەرەبیع بانگی کرد، مامەکەی یانی عیسا کوڕی عەلی بوو و دوای چەند ساتێك رێگەی چوونە ژوورەوە بەکوڕی براکەی، عیسا کوڕی موسا دا. ئەو تەنیا کەسێك بوو پێش عیسا کوڕی عەلی دەکەوت. دوای ئەوان رێگەی چوونە ژوورەوەی بەگەورەکان و بەتەمەنەکاندا. بەمشێوەیە رەبیع لەوان بۆ مەهدی و دوای ئەو بۆ عیسا کوڕی موسا لەسەر دەستی موسا ئەلهادی بەیعەتی وەرگرت.

کاتێك بەیعەت وەرگرتن لەمناڵەکانی هاشم کۆتایی پێهات، لەفەرماندە نیزامییەکان وخەڵکان بەگشتی بەیعەتی وەرگرت. عەباس کوڕی محەممەد و محەممەد کوڕی سلێمان بەرەو مەککە بەرێکەوت تا بۆ مەهدی لەخەڵکان بەیعەت وەربگرن. ئەوان لەناو کەعبە بەیعەیتان لەخەڵکان وەرگرت و سەرقاڵی بەخاك سپاردنی مەنسور بوون و ئێواریٚ کۆتاییان بەکارەکەیان هێنا. جەنازەی ئەویان بەکفن داپۆشی. روخسار و سەریان داپۆشی بەلآم لەبەر ئەوەی لەکاتی بەستنی ئیحرام مردبوو، سەریان دانەپۆشی. عیسا کوڕی موسا و یا بەوتەیەك ئیبراهیم کوڕی یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس نوێژی لەسەر خوێند و لەئارامگای مەعلات بەخاك سپێردرا. سەد گۆڕیان بۆ هەڵکەند تا خەڵکان گۆڕەکەی نەزانن و لەگۆڕێکی دیکەدا بەخاك سپێردرا. عیسا کوڕی عەلی و عیسا کوڕی محەممەد و عەباس کوڕی محەممەد و رەبیع و رەیان کە هەردووك لەموالییەکانی بوون لەگەڵ یەقتین ڕۆشتنە ناو گۆڕەکەی. لەکاتی مەرگ، شەست و سیٚ یا شەست و چوار یا شەست و هەشت ساڵ تەمەنی بوو. ماوەی خەلافەتی ئەو بیست و چوار رۆژ یا سیٚ رۆژ کەمتر لەبیست و دوو ساڵ بوو. سەبارەت

بەمەرگی ئەو وتوویانە: کاتێك گەیشتە دوا مەنزڵی نزیك مەککە، لەسەرەوەی مەنزڵگەکە ئەم نووسراوەی بینی:

بسم الله الرحمان الرحيم

ابا جعفر حانت وفاتك و انقضت　　　سنوك و امر الله لابد واقع

ابا جعفر هل كاهن او منجم　　　لك اليوم من حر المنية مانع

واتاکەی: بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان. ئەی باوکی جەعفەر! کاتی مەرگت هاتووە و ساڵەکانی تەمەنت بەسەرچووە و فەرمانی خواوەند دەبێت ئەنجام بدرێت. ئەی باوکی جەعفەر! کام کاهینە یا ئەستێرەناسە لەئێستادا دەتوانێت داغی مەرگ لەتۆ دوور بکاتەوە.

لەم کاتەدا مەنسور خزمەتکاری مەنزڵگەکەی بانگ کرد و پێی وت: ئایا فەرمانم پێ نەداویت کەس نابێت بێتە ناو ئەم مەنزڵگانە؟ وەڵامی دایەوە: سوێند بەخوا لەو کاتەوەی چۆڵ کراوە، کەس نەهاتۆتە ئێرە. مەنسور وتی: سەیرکە بزانە چی نووسراوە؟ ئەو پیاوە وەڵامی دایەوە: هیچ نابینم. مەنسور کەسێکی دیکەی بانگ کرد و ئەویش هیچی نەبینی. خۆی ئەم دوو دێرەی خوێندەوە و فەرمانی بەپەردەدارەکەیدا ئایەیەك لەقورئان بخوێنێتەوە و ئەو، ئەم ئایەی خوێندەوە: ئەوانەی ستەمکارییان کردە پیشە بەزوویی دەزانن چۆن گۆڕانیان بەسەردا دێت. مەنسور فەرمانیدا قامچی لەپەردەدارەکەی بدەن و لەبەر ئەوەی گومانی بوو، ئەو شوێنەی بەجێهێشت بەڵام لەئەسپەکەی کەوتەخوار و پشتی شکا و مرد و لەبئر مەیمون بەخاك سپێردرا. بەڵام گێڕانەوەی یەکەم راستتر دێتە بەرچاو.

تایبەتمەندییەکانی مەنسور و مناڵەکانی

ئەو گەنم رەنگ و لەڕ و روخسارێکی لاوازی بوو. لەحومەیمە لەسەرزەمینی شەرات چاوی بەدنیا هەڵهێنا. مەهدی یا هەمان محەممەد و جەعفەری گەورە کوڕەکانی بوون. دایکی ئەم دووانە ئەروی کچی مەنسور و خوشکی یەزید کوڕی مەنسوری حومەیرییە. نازناوەکەی دایکی موسایە. جەعفەر پێش مەنسور مرد. لەمناڵەکانی دیکەی ئەو دەتوانین ئاماژە بەسلێمان و یەعقوب بدەین کەدایکیان فاتیمە کچی محەممەد لەمناڵەکانی تەڵحە کوڕی عوبەیداللە بوو. یەکێکی دیکە لە

منداڵەکانی جەعفەری بچوک کەدایکی کردییە دایکی منداڵ بوو. ساڵحی مسکێن یەکی دیکە لەمنداڵەکانی بوو لەدایکی وەلەدی روومی. قاسم یەکێك لەکوڕەکانی ئەوە کە لەتەمەنی دە ساڵی لای مەنسور مرد. دایکی ئەویش دایکی وەلدی بوو کەبەدایکی قاسم بانگ دەکرا. ئەو لەنزیك دەروازەی شام باخێکی بوو کە بەباخی دایکی قاسم ناویان دەبرد. عالیە کچی مەنسور بوو کەدایکی ژنێك بوو لەمنداڵەکانی ئومەییە.

## بەشێك لەشێواز و کردەوەکانی مەنسور

سەلام ئەبرەش دەڵێت: من لەناو ماڵەکەی مەنسور خزمەتم دەکرد. مەنسور تا ئەو کاتەی نەدەڕۆشتە ناو خەڵکان، روخۆشترینی خەڵکان بوو. کاتێك جل و بەرگی لەبەر دەکرد، روخساری ڕەش دادگیرسا و چاوەکانی سوور دەبوو و کارە وەحشیانەکانی ئەنجام دەدا.

رۆژێك پێی وتم: کوڕی خۆم! هەرکات بینیت جل و بەرگم لەبەر کردووە یا لەشوێنێك گەڕاومەتەوە، کەستان لێم

نزیك نەبێتەوە، دەترسم ئازاری بدەم.

سەلام دەڵێت: لەماڵی مەنسور، کەرەستەکانی یاری کردن و سەرقاڵی یا هەر شتێکی هاوشێوە نەدەبینرا. تەنیا یەك رۆژ یەك لەمنداڵەکانی سوار وشتر بوو و هاوشێوەی سارانشینەکان خۆی رازاندەوە و کەوانێکی خستە سەرشان. بڕێك کەشك و میسواکی لەوشترەکەی بار کرد. لەیەکێك لەخورجینەکانی کەشك و لەخورجینەکەی دیکەی سیواك و شتەکانی دیکەی دانا کەوەك پێشکەشی خێوەت نشینەکان هەژمار دەکرا. ئەو بەمشێوەیە ڕۆشتەدەر و بارەکەی خۆی بەمەهدی (جێگری خەلیفە) پێشکەش کرد. خەڵك لەو کارە سەریان سوڕما. مەهدی لەروسافە (کۆشکەکەی خۆی) بوو. دیارییەکەی وەرگرت و دوو خورجینەکەی لێوانلێو کرد لەدرەم. خەڵکان زانیان ئەمە جۆرێکە لەگەمەی سوڵتانەکان.

حومادی تورك دەڵێت: مەنسور دانیشتبوو، من لای ئەو بووم کەدەنگەدەنگی بیست. وتی: بزانە ئەم دەنگە دەنگە چییە؟ ڕۆشتمەدەر و لەناکاو یەکێك

لەخزمەتکارەکانی ئەوم بینی کەکەنیزەکان دەوریان گرتبوو و ئەو سێ تاری بۆ دەژەنین و کەنیزەکان پێدەکەنن. ڕووداوەکەم بۆ مەنسور باس کرد. پرسی: سێ تار چییە؟ بۆم باس کرد.پرسی: تۆ لەکوێوە دەزانی سێ تار چییە؟ بۆم ڕوون کردەوە. مەنسور هەستا و ڕۆشتە لای کەنیزەکان. کەنیزەکان کاتێك ئەویان بینی بڵاوەیان لێکرد. فەرمانیدا سێ تارەکە لەسەری خزمەتکارەکەدا بشکێنن و دواتر کۆیلەکەی فرۆشت.

حومادی تورك دەڵێت: مەنسور، مەعن کوڕی زائدەی لەکاتی دروست بوونی ئاژاوە وەك فەرمانداری یەمەن دەستنیشان کرد. مەعن ڕۆشتە ئەو سەرزەمینە و کاروبارەکانی ڕێکخست. خەڵکان کەناوبانگی ئەویان بۆ بەخشندەیی بیستبوو، لەهەموو ناوچەکانەوە بەرەو لای ئەو بەرێکەوتن و مەعن سامانی لەناو ئەواندا دابەش کرد. بەمشێوەیە بووە هۆکاری توڕە بوونی مەنسور. مەعن کوڕی زائدە بۆ دامرکاندنەوەی توڕەی مەنسور دەستەیەك لەکەسەکانی خۆی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد. موجاعە کوڕی ئەزهەر لەناو ئەواندا دەبینرا. کاتێك ئەم دەستەیە ڕۆشتنە لای مەنسور، موجاعە وتەکانی خۆی بەسپاس کردنی خواوەند دەست پێکرد و ناوی پێغەمبەری هێنایە سەرزمان. بەئەندازەیەك وەسفی پێغەمبەری کرد خەڵکان سەریان سوڕما. دواتر وەسفی مەنسوری کرد کەچۆن خواوەند ڕێزی لێگرتووە و دوای مەنسور، ناوی مەعنی هێنایە ئاراوە. کاتێك وتەکانی کۆتایی هات، مەنسور وتی: ئەوەی سەبارەت بەخواوەند هێناتە سەرزمان، خواوەند زۆر گەورەتر لەوەیە بتوانین باسی بکەین، ئەو کاتەی وەسفی پێغەمبەرت کرد، خواوەند زیاتر لە وەسفەکانی تۆ لەپێشی پێ بەخشیوە و ئەو کاتەی وەسفی سەروەری باوەڕدارانت کرد، ئەمە تایبەتمەندییەکە خواوەند پێی بەخشیوە و بەخواستی خوا لەڕاپەڕاندنی کاروباری خەلافەت هاوکاری دەکات. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەهاوڕێکەی خۆت هێناتە سەرزمان، درۆیە و ریسوایی خۆتت نیشاندا. بڕۆدەر چوونکە بەوتەکانی تۆ ڕازی نابم.

کاتێك لەکاتی چوونەدەر گەیشتنە دووایین دەرگا، مەنسور فەرمانیدا بیانگەڕێننەوە. کاتێك گەڕانەوە، مەنسور پێی وت: تۆچیت وت؟ موجاعە وتەکانی

خۆی دووبارە کردەوە. دووبارە ئەوانی دەرکرد بەڵام لەدووایین ساتەکان فەرمانی مانەوەی پێدان. دواتر روویکردە ئامادەبووان لەهۆزی موزێر و وتی: ئایا لەناو خۆتان کەسی هاوشێوەی ئەو دەناسن؟ سوێند بەخوا بەئەندازەیەك بەپاڕاوی قسەی کرد کەرژدیم پێبرد. ئەوم گەڕاندەوە تا نەڵێن مەنسور رژدی پێبردووە چوونکە ئەو لەرەبیعەیە. کەسێکی وەك ئەو بوێر و قسەزانم نەبینیوە. ئەی کۆیلە برۆ بیانگەڕێنەوە. کاتێك موجاعە لەبەرابەر مەنسور وەستا، مەنسور پێی وت: نیازەکانت چین؟ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! مەعن کوڕی زائدە بەندەی تۆ و شمشێر و تیری تۆیە و ئەوت بۆ لای دوژمنەکانت هاویشتووە. بەڕادەیەك شمشێری وەشاند و کوشتی کەخەمەکان بەشادی و ناسازگارییەکان بەسازگاری کۆتاییان هات و چەوتییەکان راست بوونەوە و هەمووان بوونە بەندەی سەروەری باوەڕداران. ئەگەر سەروەری باوەڕداران بەهۆی بوختانی بوختان کەران دڵی لەو ڕەش بووە، شیاوە لەبەندەکەی خۆش ببێت کەهەموو تەمەنی بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکان بەسەر بردووە.

مەنسور بەداواکەی رازی و ئەوانی بۆ لای مەعن گەڕاندەوە. کاتێك مەعن نامەی لێخۆشبوونی مەنسوری خوێندەوە، ناوچاوانی موجاعەی ماچ کرد و سپاسی هاوەڵانی کرد. بەئەندازەی پێویست بەهەرکام پاداشتی بەخشی و فەرمانی پێدان بۆ لای مەنسور بگەڕێنەوە. لەم کاتەدا موجاعە وتی:

| | |
|---|---|
| آليت فى مجلس من وائل قسما | الا لبيعك يا معن بأطماع |
| يا معن! انك قد اوليتنى نعما | عمت لحيما و خصت آل مجاع |
| فلا ازال اليك الدهر منقطعا | حتى يشيد بهلكى هتفه الناعى |

واتاکەی: لەنشینگەیەك لەهۆزی وائیل سوێندم خوارد کەئەی مەعن تۆ بەهیچ تەماحێك نەفرۆشم. ئەی مەعن! تۆ نیعمەتت بەمن بەخشی کەخەڵکانی من بەتایبەت کەسە نزیکەکانی موجاعەی گرتەوە. تا ئەو کاتەی رۆژگار بەردەوامە، لەخزمەتی تۆدام و ئەمە تا ئەو کاتەیە ئەو کەسەی هەواڵی ناخۆش دەهێنێت، هەواڵی مەرگم پێبدات.

لەو بەخششانەی مەعن بەموجاعەی بەخشی، سێ نیازەکەی ئەو بوو: یەك

ئەوەی موجاعە ئەویندداری کچێك لەبنەماڵەی مەعن بوو و کاتی خوازبێنی کردن بەهۆی هەژاری موجاعە وەڵامیان نەدایەوە. موجاعە داوای ئەو کچەی لەمەعن کرد. مەعن باوکی کچەکەی بانگ کرد و کچەکەی لەبەرابەر دەهەزار درەم کەوەك مارەیی پێی بەخشی، لەموجاعە مارە کرد.

یەکی دیکە ئەوەی باخێکی بۆ موجاعە کڕی کەخوازیاری بوو و سەرئەنجام ئەوەی بڕێك پارەی داوا کرد و مەعن پێی بەخشی. مەعن سی هەزار درەمی پێ بەخشی و کۆی گشتی بەخششەکانی گەیشتە یەکسەد هەزار درەم.

دەڵێن: مەنسور دەیوت: چەندە نیازمەندی چوار (پاك) لەناو بارەگاکەی خۆمدام کەپاکتر لەوان بەرچاو نەکەوێت. ئەوانە دەبنە کۆڵەکەکانی حکومەت و دەوڵەت تەنیا بەهۆی ئەوانەوە سامان دەدرێت. یەك لەوان دادپەروەرێکە کە لەرێگەی خواوەند نابێت لەسەرکۆنەی هیچ سەرکۆنەکەرێك بترسێت. یەکی دیکە شارەوانێکە دادی ناتەوان لەبەتوانا وەربگرێت و سێیەم گەنجینەدارێك کەماڵیات بەشێوەی تەواو وەربگرێت و ستەم لەکەس نەکات.

دواتر پەنجەی خۆی سێ جار گەست و هەرجارە و هاوارێکی دڵتەزێنی دەکرد.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران چیت بەسەر دێت؟ وتی: کەسێکی بەتوانا تا کارەکانی ئەم کەسانە بەراستی و دروستی تۆمار بکات.

وتوویانە: مەنسور یەکێك لەلێپرسراوانی باجی بانگ کرد کەباجەکەی کەمی کردبوو، پێی وت: ئەوەی لەسەر شانی تۆیە، بیدە. وەڵامی دایەوە و وتی: سوێند بەخوا هیچم نییە. لەم کاتەدا بانگبێژ بانگی دەدا: اشهد ان لا اله الا الله، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند دەدەم بەم شایەتوومانە لەمن خۆشبە. مەنسور لێی خۆشبوو.

وتوویانە: کارگوزارێکیان هێنایە لای مەنسور. مەنسور داوای ماڵیاتە دوواکەوتووەکەی کرد و کارگوزارەکەی خستە زیندانەوە. کارگوزار وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! من بەندەی تۆم. مەنسور وتی: بەندەیەکی خراپیت. وتی: بەڵام تۆ سەروەرێکی چاکەکاریت. مەنسور وەڵامی دایەوە: بەڵام نەك بۆ تۆ.

وتوویانە: پیاوێکی خەواریجیان بردە لای مەنسور کەسوپایەکی مەنسوری

شکستدا بوو. مەنسور بڕیاریدا سەری لەجەستەی جیا بکاتەوە. دواتر مەبەستی ریسوا کردنی ئەوی کرد و وتی: ئەی دایك فلاّن، کەسێکی وەك تۆ سوپایەکی من تێکدەشکێنێت؟ لەوەلاّمدا وتی: هاوار لەتۆ و بەداخم بۆ حاڵی تۆ. دوێنێ شمشێر لەنێوان من و تۆ داوەری دەکرد و ئەمڕۆ جوێن و ئیهانە کردن. لەبەرچی دڵ ئاسوودە بوویت، هەنووکە کە لەژیان هیوابڕاو بووم و چاو لەمن ناپۆشیت، وەلاّمی جوێنەکانت نادەمەوە. مەنسور شەرمەزار بوو و ئازادی کرد.

وتوویانە: کاری مەنسور لەسەرەتای رۆژ، فەرماندان و رێگرتن و سەرقاڵ بوون بەکاری شارەکان و لەسەر کار لابردنی کەسەکان و لێوان لێو کردنی مەرزەکان لەسنوور پارێزەکان و ئەمن کردنی رێگەکان و کارە پەیوەندیدارەکان بەئارامی و ئاسایش بوو. کاتی شەو لەناو خێزانەکەی دادەنیشت و دووای خوێندنی نوێژی خەوتنان سەرقاڵی خوێندنەوەی نامەی سنوورەکان دەبوو و لەگەڵ هاونشینانی شەو راوێژی دەکرد. کاتێك یەك لەسەر سێی شەو تێدەپەڕی، دەڕۆشتە جێگە و هاونشینەکانی دەگەڕانەوە. دوای دوو لەسەر سێی شەو لەخەو هەڵدەستا، دەستنوێژی دەگرت و نوێژی دەخوێند تا بەرەبەیان هەڵدەهات. دواتر بۆ پێشنوێژی کردن دەڕۆشتە مزگەوت و دوای نوێژ دەگەڕایەوە و لەکۆشکەکەی دادەنیشت.

وتوویانە: مەنسور بەمەهدی وت: هیچ کارێك سەقامگیر مەکە مەگەر ئەوەی بیری لێ بکەیتەوە چوونکە بیرکردنەوە هاوشێوەی ئاوێنەیەکە کەجوانی و ناشیرینییەکان نیشانی کەسەکان دەدات. کوڕی خۆم! کاری فەرمانڕەوا تەنیا بەخۆپارێزی سامان دەگرێت و کاری فەرمانبەر تەنیا بەفەرمانبەری و وڵات تەنیا بەدادپەروەری ئاوەدان دەبێت. بەتواناترینی خەڵکان لەلێخۆشبوون، زاڵترینی ئەوانە لەڕق لەدڵ گرتن و ناتەوانترینی خەڵکان ئەو کەسەیە ستەم لەکەسێکی ژێردەستە بکات. لەهەڵبژاردنی هاوڕێ، کار و زانستی ئەو لەبەر چاو بگرە.

ئەی باوکی عەبدوڵڵا! لەهیچ شوێنێك دامەنیشە مەگەر ئەوەی زاناکان هاوڕێیەتیت بکەن و لەگەڵ تۆ بدوێن. ئەو کەسەی حەز بەوەسف کردن بکات، شێوازی خۆی دەگۆڕێت و هەرکەس حەز بەوەسف کردن نەکات، بەشێوەیەکی

خراپ هەڵس و کەوت دەکات و کەس وەسف کردن بەنەشیاو نازانێت مەگەر ئەوەی سەرکۆنە بکرێت و کەس سەرکۆنە ناکرێت مەگەر ئەوەی بەقێزەونی هەژمار بکەن.

ئەی باوکی عەبدوڵلا! بیرمەند ئەو کەسە نییە ئەندێشە لەکارێك بکات کەگرفتار بووە پێی، بەڵکو بیرمەند کەسێکە پێش ئەوەی گرفتار ببێت، ئەندێشە بکات.

رۆژێك مەنسور بەمەهدی وت: چەند ئالآت (سوپا) هەیە؟ مەهدی وتی: نازانم. مەنسور وتی: اناالله، تۆ پێش هەرکەسێك خەلافەت بەفیڕۆ دەدەیت بەلآم ئەوەندم بۆ تۆ پاشەکەوت کردووە کەئەم فیڕۆییە زیانت لێ نادات.

دەگێڕنەوەك رۆژێك مەنسور وتاری دەخوێندەوە. لەوتارەکەیدا وتی: سپاس تایبەتە بەخوا و سپاسی دەکەم و داوای هاوکاری لێدەکەم، باوەڕم پێیەتی و کارەکانی خۆم بەو دەسپێرم و شایەتی دەدەم هیچ خوایەك جگە لە الله نییە و تاقانەیە بێ هیچ شەریکێك.

لەم کاتەدا پیاوێك قسەکەی پێ بڕی و وتی: ئەی ئادەم! تۆ بەوەی بیرت هێنایەوە، بەبیرت دێنمەوە. مەنسور وتارەکەی خۆی بڕی و وتی: بەچاوی منەت، بەچاوی منەت لەکەسێك کەسنوور پارێزی سنووری خواییە، لەوەی زۆردار و سەرکەش بم یا سەرمەستانە گوناح ئەنجام بدەم. پەنا بۆ خواوەند دەبەم چوونکە ئەگەر ئەو کارە بکەم بەلارێدا ڕۆشتووم و لەرزگار نەبووانم. تۆ ئەی پیاو! سوێند بەخوا ئەم وتەت بۆ رەزامەندی خواوەند نەهێنایە سەرزمان بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەی بڵێن فلآن کەس هەستایە سەرپێ و قسەیەکی هێنایە سەرزمان. مەنسور سزای ئەو پیاوەیدا و پیاوەکە خۆڕاگری کرد. وتی: ویستم سزات بدەم بەلآم لەو کارە چاوم پۆشی کەواتە لێخۆشبوونی من بەهەڵ بزانە.

هەم تۆ و هەم ئێوە ئەی موسوڵمانان چیتر بەمشێوەیە بوێری لەخۆتان نیشان مەدەن چوونکە حیکمەت بۆ ئێمە هاتۆتە خوار و لەلای ئێمەوە بلاو بۆتەوە. کەواتە کاروبارەکان بەکەسانی شیاو بسپێرن و لەکار و کردەوەکانی خۆتان ئەندێشە بکەن. دوواتر وتارەکەی خۆی دەستپێکردەوە وەك بڵێی دەیخوێندەوە. وتی: شایەتی دەدەم محەممەد بەندە و نێردراوی خواوەندە.

عەبدوالله کوڕی ساعد دەڵێت: مەنسور دوای دروست کردنی بەغداد لەمەککە وتارێکی خوێندەوە. وتی: و لەراستیدا لەزەبور لەدوای تۆ راستمان نووسی کە بەندە شیاوەکانی ئێمە زەوی بەمیرات دەبەن. ئەمە وتەیەکی بەهێز و لێوانلێوە لەداد و دادپەروەری. سپاس تایبەتە بەو خوایەی بورهانەکانی خۆی ئاشکرا کرد و دوور بن ئەو کەسانەی کەعبەیان کردۆتە مەبەستی خۆیان و هاوشێوەی تالآنی و میراتی خۆیان لێی دەڕوانن و ئەو کەسانەی قورئانیان لەت لەت دەکرد و ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد ئەوانی گرفتار کرد. چەندە چاڵە کوێر و کۆشکە بەرزەکان کەخواوەند بەهۆی گۆڕانی سوونەتی پشتی تێکردن، ئەوانیش وانەیان وەرنەگرت و پێداگرییان کرد و پێیان زیاتر راکێشا و لەمێشکیاندا ئەمەیان پەروەراند و (( هەر ستەمکارێکی سەرکەش زیانی پێ برا)) کەواتە ((ئایا کەسێك لەوان دەبینی یا دەنگیان دەبیستی؟))

بێژەر دەڵێت: پیاوێك سکالآی لەیەکێك لەکارگوزارەکانی مەنسور کرد. مەنسور لەهەمان نامە بۆ کارگوزارەکەی خۆی نووسی: ئەگەر دادپەروەریت هەڵبژارد، رزگاری دەبێتە هاورێت، و ئەگەر ستەم هاورێیەتیت دەکات، رووبەرووی پەشیمان بوونەوەی من دەبیت، کەواتە چیتر ستەم لەو کەسە مەکە.

وتوویانە: فەرمانداری ئەرمەنستان نامەیەکی بۆ مەنسور نووسی و ئاماژەی پێدا کەسوپاکەی دژی ئەو ئالآی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە و گەنجەکانیان فڕاندووە. مەنسور لەهەمان نامە وەڵامی دایەوە: سەرکۆنەکراو و دوورخراوە لەکارەکەی ئێمە خۆت بەدوور بگرە چوونکە ئەگەر ئەندێشەت دەکرد دژی تۆ شۆڕشیان نەدەکرد و ئەگەر بەتوانا دەبوویت گەنجەکانی تۆیان نەدەڕفاند.

وتە و وەسیەتەکانی ئەو نیشانەی زمان پاراوی و بەتوانایی ئەوە بەهەمان شێوە کەنووسینەکانی بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەوەی کە لەرۆژگاری خۆیدا بێ وێنە بووە بەلآم دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کەزیاد لەڕادە پەست و رەزیل بووە و ئەمەیش لەگێڕانەوەی زەین کوڕی عەتا سەرچاوە دەگرێت. دەڵێت:

مەنسور هاتە سەردانی من، چوونکە پێش خەلافەت هاورێی یەك بووین. رۆژێك دوو بەدوو دانیشتبووین. مەنسور وتی: ئەی باوکی عەبدوالله! چیت هەیە؟ وتم:

هەر ئەوەی دەیزانی. پرسی: ژن و منداڵ چەند کەست لایە؟ وتم: سێ کچ، ژنێك و خزمەتکارێك. وتی: چوار کەس لەماڵەکەی تۆدایە؟ وتم: بەڵێ. چەند جارێك وتەکەی خۆی دووبارە کردەوە بەشێوەیەك گومانم کرد هاوکاریم دەکات. وتی: تۆ دەوڵەمەندترین پیاوی عەرەبیت. چوار ژن لەماڵەکەی تۆدا تەشی دەرێسێت.

وتوویانە: کۆیلەکەی باوکی عەتای خوراسانی ئاگاداری کردەوە کەباوکی عەتا دەهەزار درهەمی هەیە. مەنسور پارەکەی لێسەند و وتی: ئەم پارەیە هی منە. باوکی عەتا وتی: چۆن ئەم پارەیە هی تۆیە لەکاتێکدا سوێند بەخوا نەکارێکت بەمن سپاردووە و نە هیچ خزمایەتییەك لەنێوان من و تۆدا هەیە. مەنسور وتی: بەڵێ، تۆ لەگەڵ هاوسەری عۆیەیینە کوڕی موسا کوڕی کەعب پەیوەندی هاوسەرگیریت بەستووە و ئەو ئەم پارەی وەك میرات بۆ تۆ داناوە لەکاتێکدا هاوسەرەکەی لەو کاتەی کارگوزاری سند بوو، نافەرمانی کردە پیشە و پارەکانی منی هەڵگرت و ئەمە هەمان پارەیە.

بەجەعفەری سادقیان وت: مەنسور زۆربەی کات جل وبەرگی هەراتی لەبەر دەکات و خۆی جلەکانی دەدورێتەوە. وتی: سپاس بۆ ئەو خوایەی بەزەیی بەودا هاتۆتەوە و لەگەڵ ئەوەی دەسەلاتی لەدەستایە، گرفتاری هەژاری کردووە.

وتوویانە: هەرکاتێك مەنسور کارگوزارێکی لەسەر کار لادەبرد، دەستی بەسەر سامانەکەیدا دەگرت و بەشێوەیەکی جیا لەگەنجخانە دایدەنا. ناوی هەر کەسێکی لەسەر سامانەکەی دەنووسی. رۆژێك بەمەهدی وت: شتێکم بۆ تۆ کۆکردۆتەوە، هەرکاتێك مردم ئەو کەسانەی دەستم بەسەر سامانیاندا گرتووە بانگ بکە و بۆیان بگێڕەوە. چوونکە بەم کارە وەسفی تۆ دەکەن و بەکەسێکی چاکەکار ناوت دەبەن. مەهدی ئەو کارەی کرد.

ئەو بەپێچەوانەی ئەم تایبەتمەندییانە، شێوازی دیکەیشی دەگرتەبەر.

وتوویانە: زەید کۆیلەی عەیسا کوڕی نەهیك دەڵێت: مەنسور دوای مەرگی گەورەم منی بانگ کرد و پرسی: ئەو چەندە سامانی بەجێهێشتووە؟ وتم: هەزار دینار کەژنەکەی لەریً ورەسمی بەخاك سپاردن خەرجی کرد. مەنسور پرسی: چەند کچی هەیە؟ وتم: شەش کچ. مەنسور کەمێك سەری داخست، دواتر سەری

بەرز کردەوە و وتی: بڕۆ لای مەهدی. منیش ڕۆشتمە لای مەهدی و ئەو سەد و هەشتا هەزار دیناری بەمن بەخشی یانی هەر کچێك سی هەزار دینار. دواتر مەنسور منی بانگ کرد و وتی: دووبارە وەرە لای من و بۆ ئەم کچانە هاوسەری شیاو بدۆزەرەوە تا مارەیان بکەم. ئەو کارەم کرد و مەنسور ئەوانی بەشوودا و فەرمانیدا خەرجییەکان لەسامانەکەی خۆی بدەن. بەهەر کام لەکچەکان سی هەزار درەمی بەخشی و فەرمانی بەمندا بەسامانی ئەوان زەوی بکرم تا بژێوی ژیانیان دابین بکات.

وتوویانە: مەنسور لەیەك ڕۆژدا بەدەستەیەك لەکەسەکانی دە هەزار هەزار درەمی بەخشی و بەدەستەیەك لەمامەکانی و لەناو ئەوان: سلێمان، عیسا، ساڵح هەرکام هەزار هەزار درهەمی بەخشی. ئەو یەکەم کەس بوو بەمشێوەیە پاداشتی بەکەسەکانی خۆی دەبەخشی.

گێڕانەوەکان لەمبارەوە سەبارەت بەو فراوانن بەشێوەیە ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکە داوە. یەزید کوڕی عومەر کوڕی هوبەیرە دەڵێت: هیچ کات لەجەنگ کەسێکی نەشیاو بۆ ئاشتی و وشیارتر و چارەسەرکەرترم لەمەنسور نەبینیوە و نەمبیستووە.

ئەو بۆ ماوەی نۆمانگ گەمارۆی خستە سەرمن لەکاتێکدا جەنگاوەرانی عەرەب هاورێیەتی منیان دەکرد. زۆرمان هەوڵدا زیان لەئوردووگاکەی بدەین و ڕێگەی سەرکەوتنی لێ بگرین بەڵام هەوڵەکانمان بێ ئەنجام بوو. کاتی گەمارۆکە مووی سپی لەسەرما نەدەبینرا و کاتێك هاتنەدەر لەبازنەی گەمارۆ، مووی سەرم تاڵی ڕەشی تیا نەدەبینرا.

وتوویانە: هوبەیرە لەکاتی گەمارۆکە لەلایەن مەنسورەوە پەیکێکی بۆ لای ئەو نارد و داوای شەڕی دەستەویەخەی لێکرد. مەنسور بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە: تۆ سنوورەکانت بەزاندووە و جڵەوی خۆتت بەرداوە. خواوەند ئەو بەڵایەی بەشیاوی دەزانێت بۆ تۆی ئامادە کردووە و شەیتان بەوەی خواوەند بەدرۆی هەژمار دەکات، تۆی فریوداوە، شەیتانێك کەئەوەی خواوەند نزیکی دەکاتەوە، دووری دەخاتەوە، کەواتە کەمێك چاوەڕوان بە تا خواوەند بەڵاکەی خۆی بەسەر تۆدا دابارێنێت.

هەنووکە نمونەیەك بۆ خۆم و تۆ باس دەکەم: دەگێڕنەوە شێرێك رووبەرووی بەرازێك بوویەوە. بەرازەکە پێی وت: با پێکەوە شەڕ بکەین. شێر وەڵامی دایەوە: تۆ بەرازیت و هاوتا و هاوشانی من نیت و ئەگەر شەڕ لەگەڵ تۆ بکەم و خوێنت بڕێژم دەڵێن بەرازێکی کوشتووە و ئەم کارە نەهیچ سوودێك بەمن دەگەیینێت نە ناوبانگم فراوان دەکات و ئەگەر لەلایەن تۆوە زیانێك بەمن بگات، تەنیا سەرکۆنە کردن بۆ من دەمێنێتەوە. بەراز وتی: ئەگەر شەڕ لەگەڵ من نەکەیت، دڕندەکانی دیکە ئاگادار دەکەمەوە کە تۆ بەشەڕ لەگەڵ من رازی نەبوویت. شێر وتی: رازی بوون بەنەنگی درۆکەی تۆ بۆ من زۆر ئاسانتر لەوەیە خوێنی خۆم لەگەڵ تۆ تێکەڵاو بکەم.

وتوویانە: مەنسور یەکەم کەس بوو باوەشێنی کارەبایی (بەتەناف دەیانجوڵاند) بەکار برد. زۆربەی خوسرەوەکانی ئێران و منداڵەکانی ئومەییە ئەوماڵەی هاوینان ژیانیان تیا بەسەر دەبرد، رۆژانە بەگڵ سواخیان دەدا.

دەگێڕنەوە: رۆژێك پیاوێك لەمنداڵەکانی ئومەییەیان بردە لای مەنسور. مەنسور پێی وت: چەند پرسیارێکم لەتۆ هەیە، ئەگەر راستی بڵێیت، ئەمانت پێ دەبەخشرێت. ئەو پیاوە رازی بوو. مەنسور پرسی: منداڵەکانی ئومەییە چۆن گرفتاری ئەم چارەنووسە بوون؟ وتی: بەدرکاندنی راستییەکان. مەنسور پرسی: کام سامانەیان بەبەهاتر دادەنا؟ وتی: گەوهەر. مەنسور پرسی: ئەمەکدارییان لای کێ بینی؟ وتی: لای خزم و کەس و کار. مەنسور مەبەستی ئەوەی کرد کاری سیخوری بەکەسانی بنەماڵەکەی خۆی بسپێرێت بەڵام بیری کردەوە کەبەم کارە لەبەهای ئەوان کەم دەکاتەوە و لەبەر ئەمە ئەو کارەی بەمواڵییەکانی ئەوان سپارد.

## خەلافەتی مەهدی و وەرگرتنی بەیعەت بۆ ئەو

عەلی کوڕی محەممەدی نەوفلی لەباوکی دەگێڕێتەوە: بەمەبەستی حەج بەسرەم بەجێهێشت و لەزات عێرەق چاوم بەمەنسور کەوت. دوای ئەوە هەرکات سوار ئەسپ دەبۆو سڵاوم لێدەکرد. ئەو لەسەرەمەرگدا بوو. کاتێك گەیشتە بئر مەیمون، دابەزی. ئێمە ڕۆشتینە مەککە و حەجی عەمرەمان بەجێهێنا و بەهەمان شێوە

هاتوچۆی مەنسورم دەکرد. لەشەوی مەرگی ئەو کەئێمە ئاگادار نەبووین، نوێژی بەیانیم لەمەککە خوێند و هاوڕێ لەگەڵ محەممەد کوڕی عەون کوڕی عەبدوالله و حارس کە لەگەورەکان وکەسە دیارەکانی منداڵەکانی هاشم بوو بەڕێکەوتین. کاتێك گەیشتینە ئەبتەح عەباس کوڕی محەممەد و محەممەد کوڕی سلێمانمان لەگەڵ دەستەیەك سوار بینی کە بەرەو مەککە دەڕۆشتن. سڵاومان لەو دووانە کرد و گوزەرمان کرد. بە محەممەدم وت: گومان دەکەم مەنسور مردبێت و گومانەکەم ڕاست بوو. هەردووك گەیشتینە ئوردووگا کە لەناکاو موسا کوڕی مەهدیمان بینی لەخێوەتەکە دەهاتەدەر و قاسم کوڕی مەنسور لەسوچێکی خێوەتەکە وەستا بوو. ئەو پێشتر هەواڵبەری نێوان مەنسور و فەرماندەی پاسەوانەکان بوو و خەڵکان سکالاکانی خۆیان تەسلیمی ئەو دەکرد. کاتێك ئەوم بینی لەمەرگی مەنسور دڵنیا بووم.

لەم کاتەدا حەسەن کوڕی زەیدی مەنسوری هات و بەرادەیەك خەڵکان هاتن خێوەت و بارەگاکە پڕ بوو. دەنگی گریان بەگوێ دەگەیشت. باوکی عەنبەر کۆیلەی مەنسور لەکاتێکدا یەخەی خۆی دەدڕی و خۆڵی بەسەردا دەکرد، بەدەم هاوارەوە دەیوت: ئەی هاوار، سەروەری باوەڕداران. هەمووان هەستان و بەڕێکەوتن تا بڕۆنە لای جەنازەکە بەڵام کۆیلەکان ڕێگەیان لێگرتن. کوڕی عەیاشی مەنتوف وتی: پاك و خاوێنە خواوەند، ئایا هەرگیز بینەری مەرگی خەلیفەیەك نەبوون.؟ دانیشن. هەمووان دانیشتن. قاسم هەستا و یەخەی خۆی دڕی و خۆڵی کرد بەسەریا لەکاتێکدا موسا بەهەمان شێوە دانیشتبوو.

لەم کاتەدا ڕەبیع کەوەرەقێکی بەدەستەوە بوو، هات. وەرقەکەی کردەوە و خوێندیەوە: بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان، لەبەندەی خوا مەنسور، سەروەری باوەڕداران، بۆ پاشماوەی منداڵەکانی هاشم و شوێنکەوتەکانیان لەخوارسانییەکان و هەموو موسوڵمانان. لێرەدا ڕەبیع دەستی بەگریان کرد و خەڵکانیش گریان. وتی: گریان بەسەر ئێوەدا زاڵ بووە، ڕەحمەتی خواوەند لەئێوە بێت، کەمێك ئارام بن و گوێ بگرن. دواتر خوێندییەوە: دوای سپاسی خواوەند، ئەم نامەیە لەکاتێکدا دەنووسم کەدوایین ڕۆژگاری ئەم جیهان و ژیانە بەسەر

دەبەم. سلاّو بۆ هەمووتان دەنێرم و لەخوا داوا دەکەم دوای من گرفتاری ئاژاوەتان نەکات و دووبەرەکی نەخاتە ناوتانەوە و ئازار و زیانی یەکتر نەچێژن. دواتر پێشنیاری بەیعەت کردن لەگەڵ مەهدی پێکردن و بەیعەتی ئەوی بیرخستنەوە و بۆ ئەمەکدار بوون هانیدان. لەم کاتەدا رەبیع دەستی حەسەن کوڕی زەیدی گرت و وتی: بۆ بەیعەت هەستە سەرپێ. ئەو هەستا و لەگەڵ موسا کوڕی مەهدی بەیعەتی بەست و خەڵکان یەك لەدوای یەك هەستان. دواتر منالەکانی هاشم ڕۆشتنە سەر جەنازەکەی مەنسور لەکاتێکدا جەستەی بەکفن داپۆشرابوو بەلاّم سەری دیار بوو. جەنازەکەمان هەڵگرت و دوای بڕینی سێ میل گەیشتینە مەککە. سەیرم دەکرد و دەمبینی با چۆن قژەکانی پەرێشان دەکات چوونکە قژی خۆی درێژ کردبوو تا لەکاتی حەج بیتاشێت. رەنگی خەنەکەی قژی کاڵ ببوویەوە و بەمشێوەیە ئەومان بەخاك سپارد.

عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان بەتوانایی خۆی نیشاندا و ئەمە لەکاتێکدا عیسا کوڕی موسا (جێگری خەلیفەی لەسەر کار لابراو) بەبەیعەت بەستن رازی نەبوو. عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان پێی وت: سوێند بەخوا یا بەیعەت دەبەستیت یا سەرت لەجەستە جیا دەکەمەوە. ئەو بەناچاری بەیعەتی بەست. ئەوسا موسا کوڕی مەهدی و رەبیع هەواڵی مەرگی مەنسور و وەرگرتنی بەیعەت بۆ مەهدییان بەمەنارە کۆیلە تایبەتییەکەی مەنسور بۆ مەهدی ڕەوانە کرد. ئەو دووانە داردەست و رووپۆشەکەی پێغەمبەر (د.خ) و ئەنگوستیلەی خەلافەتیان بۆ نارد و خۆیان لەمەککەوە بەرێکەوتن. مەنارە ئەم هەواڵەی لەنیوەی زیئەلحەجەجە/ ١٥ ئۆکتۆبەری ٧٧٥ زایینی بەمەهدی گەیاند و خەڵکانی بەغداد بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

وتوویانە: رەبیع مەرگی مەنسوری شاردەوە، جل و بەرگی لەبەر کرد و ئەوی دانیشاند. تۆڕێکی بەروخساریدادا کەجەستەی دەردەکەوت بەلاّم بەشێوەیەکی نەناسراو. رەبیع بنەماڵەی مەنسوری لەوان نزیك کردەوە و خۆیشی لێی نزیك کەوتەوە وەك بڵێی قسەی لەگەڵ دەکات. دواتر بۆ لای خەڵکان گەڕایەوە و فەرمانی پێدان بەیعەتی خۆیان بۆ مەهدی تازە بکەنەوە. ئەوانیش بەیعەتیان بەست. رەبیع

ئەوانی بۆ چوونە دەرەوە ڕێنوێنی کرد کە لەناکاو بەچاوی پڕ فرمێسک لەکاتێکدا لەخۆی دەدا، هاتە ناو خەڵکان. کاتێك مەهدی لەم کارە ئاگادار بوویەوە، ئەم کارەی ئەوی بەناپەسەند وەسف کرد و وتی: ئایا گەورەیی سەروەری باوەڕداران ڕێگەی ئەم کارەی لێنەگرتیت؟ وتوویانە: مەهدی، ڕەبیعی قامچی باران کرد بێ ئەوەی ژمارەی قامچییەکانی خۆی بژمێرێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەنسور، موسەییب کوڕی زوهەیری لەفەرماندەیی پاسەوانەکان دوور خستەوە و زیندانی کرد چوونکە موسەییب ئەبان کوڕی بەشیری کاتبی بەڕادەیەك ئەشکەنجە کردبوو کەمرد لەبەر ئەوەی شەریکی براکەی عەمرۆ کوڕی زوهەیر لەحکومەتی کوفە بوو. مەنسور حەکەم کوڕی یوسفی وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی دەستنیشان کرد بەڵام دوای قسەکانی مەهدی لەگەڵ باوکی، مەنسور لەگوناحەکەی موسەییب چاوی پۆشی و دووبارە فەرماندەیی پاسەوانەکانی بەو سپارد.

لەم ساڵەدا مەنسور، نەسر کوڕی حەرب کوڕی عەبدوڵڵەی وەك کارگوزاری پارس دەستنیشان کرد. لەم ساڵەدا مەهدی لەمانگی ڕەمەزان/ مارسی ٧٧٥ زایینی لەڕەقە گەڕایەوە و لەم ساڵەدا مەعیوف کوڕی یەحیا لەدەرب ئەلحەدەس لەشەڕێکی هاوینەدا ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە بەڵام ماوەیەك دواتر دەستیان لەجەنگ هەڵگرت.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ئیمام کەفەرمانداری مەککە بوو، بەفەرمانی مەنسور دەستەیەکی زیندانی کرد. ئەم دەستەیە لەم کەسانە پێکدەهاتن: پیاوێك لەبنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەککە، کوڕی جورەیج، عوباد کوڕی کەسیر و سوفیانی سەوری. بەڵام بێ فەرمانی مەنسور ئەوانی ئازاد کرد و بەم کارەی ئاگری تووڕەیی مەنسوری خۆش کرد. پاڵنەری بۆ ئازاد کردنی ئەوان ئەمە بوو کەئەو کارەی بەناڕەوا هەژمار کرد و بەخۆی وت: من خزمەکانی خۆم یانی مناڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبم لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانە

دیارەکان زیندانی کردووە، ئەگەری هەیە سەروەری باوەڕداران بێت و فەرمانی کوشتنی ئەوان دەربکات و بەمشێوەیە سەقامگیری بەحکومەتەکەی خۆی ببەخشێت و خوێنی ئەوان دەکەوێتە ئەستۆی من. کاتێك مەنسور لەمەککە نزیك کەوتەوە، محەممەد کوڕی ئیبراهیم چەندین دیاری گرانبایی بۆ ڕەوانە کرد بەلاّم مەنسور هەموو دیارییەکانی گەڕاندەوە.

لەم ساڵەدا مەنسور بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ مەککە بەغدادی بەجێهێشت بەلاّم پێش گەیشتن بەمەککە کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس رووی کردە جەنگ لەگەڵ شاری قورییە و مەبەستی لەناو بردنی ئەو بەڕبەڕانەی کرد کەکارگوزارەکەی ئەویان تەسلیم بەشەقنا کردبوو. دەستەیەکی فراوان لەوانی کوشتار کرد و شوێن شەقنا کەوت و لەکۆشکی ئەبیەز و دەرب گوزەری کرد بەلاّم نەیتوانی بیگرێت.

لەم ساڵەدا ئەورالی سوڵتانی گالیسیا مرد کەحکومەتەکەی شەش ساڵ درێژەی کێشا و دوای ئەو شالون هاتە سەرکار.

لەم ساڵەدا مالك کوڕی مەغولی فەقیە بوجلی لەکوفە و حەیوەت کوڕی شورەیح کوڕی موسلیمی حەزرەمی میسری کۆچی دواییان کرد.

لەم ساڵەدا کارگوزاری مەککە و تاییف ئیبراهیم کوڕی محەممەد و عەلی کوڕی عەبدوالله و کارگوزاری مەدینە عەبدسەمەد کوڕی عەلی و کارگوزاری کوفە عەمرۆ کوڕی زوهەیری زەببی یا ئیسماعیل کوڕی ئیسماعیلی سەقەف و دادیاری ئەو شارە شەریك کوڕی عەبدواللەی نەخەعی و سەرپەرەستی گەنجخانە سابت کوڕی موسا و کارگوزاری خوراسان حومەید کوڕی قەحتەبە و دادیاری بەغداد عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی سەفوان و فەرماندەی پاسەوانەکانی عومەر کوڕی عەبدولرەحمان برای عەبدجەبار کوڕی عەبدولرەحمان یا موسا کوڕی کەعب و سەرپەرەستی گەنجخانەی بەسرە عومارە کوڕی حەمزە و قازی و پێشنوێژەکەی عوبەیدالله کوڕی حەسەنی عەنبەری بوو. خەڵك لەم ساڵەدا گرفتاری نەخۆشی گشتگیری پەتاّ بوون.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پەنجا و نۆی کۆچی ( ٧٧٥ زایینی )

### بیرکردنەوەی حەسەن کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله

لەم ساڵەدا مەهدی، حەسەن کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی لەزیندانەکەی خۆی بۆ زیندانێکی دیکە گواستەوە. هۆکاری ئەم گواستنەوە ئەوە بوو کەحەسەن کوڕی ئیبراهیم لەگەڵ داوود کوڕی یەعقوب لەیەك زینداندا بوون. کاتێك یەعقوب ئازاد بوو و حەسەن کوڕی ئیبراهیم بەتەنیا مایەوە، لەگیانی خۆی ترسا و بیری لەهەڵاتن کردەوە. پەیامی بۆ یەکێك لەناسراوەکانی خۆی نارد کەبڕوای پێدەکرد. ناسراوەکەی ئەو تا شوێنی زیندانەکەی حەسەن تونێلێکی لەژێر زەوییەوە هەڵکەند. یەعقوب لەم کارە ئاگادار بوویەوە و ڕۆشتە لای عولاسەی قازی. ئەو لەگەڵ کوڕی عولاسە پەیوەندی هەبوو. بەکوڕی عولاسەی وت: هەواڵێکی ناخۆشم بۆ مەهدی پێیە و داوای لەکوڕی عولاسە کرد ئەو بۆ لای باوکی عوبەیداللەی وەزیر ببات تا لەنهێنییەکەی خۆی ئاگاداری بکاتەوە. ئەویش یەعقوبی بۆ لای باوکی عوبەیدالله برد. کاتێك باوکی عوبەیدالله ئاگادار بوویەوە، یەعقوب داوای لێکرد ئەو بۆ لای خەلیفەکەی خۆی ببات تا لەم هەواڵە ئاگاداری بکاتەوە. باوکی عوبەیدالله یەعقوبی بۆ لای مەهدی برد. لەدانیشتنەکەدا کەس جگە لەوەزیر و کوڕی عولاسە نەمایەوە. مەهدی یەعقوبی دڵنیا کردەوە لەوەی دەتوانێت قسەکانی خۆی بێ نیگەرانی بکات چوونکە ئەو لەکوڕی عولاسە و باوکی عوبەیدالله ئاسوودە و دڵنیا بوو. بەڵام یەعقوب دووبارە بێدەنگی هەڵبژارد. بەناچار ئەو دووانەیش ڕۆشتنەدەر و یەعقوب خەلیفەی لەمەبەستەکەی حەسەن کوڕی ئیبراهیم ئاگادار کردەوە. مەهدی کەسێکی ڕەوانە کرد تا لەراستی هەواڵەکەی یەعقوب بکۆڵێتەوە و فەرمانیدا حەسەن لەو زیندانەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوازنەوە و بەم شێوە بوو زیندانەکەی ئەویان گواستەوە. دوای ئەوە حەسەن بیری لەرێگە چارەیەکی دیکە کردەوە و توانی لەزیندان رابکات. بەشوێن حەسەندا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە. مەهدی یەعقوبی

بانگ کرد و پرسیاری حەسەنی لێکرد، یەعقوب، مەهدی لەبێ ئاگایی خۆی ئاگادار کردەوە. ئەو بەخەلیفەی وت: ئەگەر سەروەری باوەڕداران ئەمان ببەخشێت، حەسەن دەڕواتە لای. یەعقوب بەخەلیفەی وت: باشتر لەشوێن کەوتنی ئەو دەست هەڵگرن چوونکە ئەم کارە دەیترسێنێت. مەهدی ئەمانی بەحەسەن بەخشی ولەشوێنکەوتنی ئەو دەستی هەڵگرت. ماوەیەك دواتر یەعقوب ڕۆشتە لای مەهدی و حەسەن کوڕی ئیبراهیمی لەگەڵ خۆی برد.

## چۆنیەتی ڕۆشتنی یەعقوب بۆ لای مەهدی

پێشتر ئامارژەمان پێدا یەعقوب چۆن ڕۆشتە لای مەهدی. کاتێك لەپێشهاتی حەسەن کوڕی ئیبراهیم، مەهدی ئەوی بانگ کرد، بەمەهدی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ پانتایی دادپەروەری خۆت بۆ هاوولاتیان بلاو کردۆتەوە و بەیەك چاو سەیریان دەکەیت و چاکەکارانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکەیت و ئەوان بەتۆ هیوادارن. چەند شتێك ماوەتەوە ئەگەر پێت بڵێم لێکۆڵینەوەیان لێدەکەیت. لەو دیو ئەم دەرگایە ئەوە ڕوودەدات کەلێی بێ ئاگایت و ئەگەر مۆڵەتم پێ بدەیت، تۆیان لێ ئاگادار دەکەمەوە.

مەهدی فەرمانی ئەم کارەی پێدا و ئەو هەرکاتێك دەڕۆشتە لای خەلیفە، پێشنیاری کارە چاکەکانی پێدەکرد. پێشنیاری وەك سنوور و سنوورپارێزەکان، بناغە دانانی قەلاکان، هێز بەخشین بەجەنگاوەران، بەشوودانی ژنان، ئازاد کردنی زیندانییەکان، دانەوەی قەرزی قەرزاران و ... بەمشێوەیە یەعقوب لای مەهدی پێگەی بەرز بوویەوە تا ئەوەی باوکی عوبەیدالله لەکار دوورخرایەوە وخرایە زیندانەوە. مەهدی لەنامەیەکدا بۆ یەعقوبی نووسی کەئەوی وەك برای دینی (زربرا) خۆی هەڵبژاردووە و سەد هەزار درەمی وەك دیاری بۆ نارد.

## دەرکەوتنی موقەنەع لەخوراسان

لەم ساڵەدا پێش مەرگی حومەید کوڕی قەحتەبە، موقەنەع لەخوراسان شۆڕشی کرد. ئەو پیاوێکی یەك چاو و کورتە باڵا لەخەڵکانی مەرو بوو. بەحەکیم ناویان دەبرد. دەمامکێکی زێڕینی لەروخسار دەبەست تا کەس نەیبینێت و لەبەر ئەمە بەموقنەع (دەمامك پۆش) ناوی دەرکرد. خۆی بەخوا ناو برد بەڵام ئەم کارەی لای هەموو هاورێکانی ئاشکرا نەکرد. دەیوت: خواوەند ئادەمی ئافراند و دواتر ڕۆشتە روخساری ئەو و دوای ئەو نوح و دوای ئەو ڕۆشتە روخساری کەسانی دیکە تا ئەوەی گەیشتە ئەبوموسلیمی خوراسانی، دواتر ڕۆشتە ناو روخساری هاشم. لەسەر بنەمای باوەڕ بەخۆ، هاشم، هەمان دەمامك پۆش بوو. ئەو باوەڕی بەگوێزرانەوەی ڕۆحەکان (تەناسوخ) هەبوو و دەستەیەك لەگومڕاکان شوێنی کەوتن و لەهەر شوێنێك سەری کوڕنوشیان بۆ دانەواند. لەکاتی جەنگ هاواریان دەکرد: ئەی هاشم، هاوکاریمان بکە.

خەڵکانێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە و لەقەڵای بسنام و سەنجردە لەگوندەکانی کێش، سەنگەریان گرت. سپی پۆشەکانی بوخارا ( لەجیاتی ڕەش کەدروشمی منداڵەکانی عەباس بوو، سپی پۆشییان هەڵبژارد) و سوغد هاوکارییان کرد و کافرە تورکەکان پشتیوانیان لێکرد و دەستیان بەسەر سامانی موسوڵماناندا گرت.

باوەڕی وابوو کەئەبو موسلیم لە پێغەمبەر (د.خ) گەورەترە و کوژرانی یەحیا کوڕی زەیدی بەقێزەون دەزانی و وای نیشان دەدا مەبەستی ئەوەی لەسەردایە تۆڵە لەبکوژەکەی بستێنێتەوە.

ئەوان لەکێش کۆبوونەوە و دەستیان بەسەر بەشێك لەکۆشکەکان و قەڵای نەواکسدا گرت. باوکی نەعمان و جونەید و لەیس کوڕی نەسر کوڕی سەیار و محەممەد کوڕی نەسر و دەستەیەکی دیکەیان کوشت. جبرائیل کوڕی یەحیا و براکەی یەزید بۆ شەڕی ئەو ڕەوانە کران و رووبەرووی سپی پۆشەکانی بوخارا بوونەوە. جەنگی ئەوان لەبومێجکەس چوار مانگ درێژەی کێشا تا ئەوەی بۆ گەیشتن بەوان تونێلیان لەژێر زەوی لێدا و بەمشێودیە توانییان حەوتسەد کەس لەوان بکوژن. لەم ناوەدا حەکەم فەرماندەی سپی پۆشەکان کوژرا و هەڵاتووان

خۆیان گەیاندە موقەنەع. جبرائیل شوێنیان کەوت و شەری لەگەڵ دەکردن. مەهدی باوکی عەدەنی بۆ شەڕ لەگەڵ موقەنەع ڕەوانە کرد بەلاّم بەشێوەی پێویست هەوڵی نەدا و مەهدی، مەعاز کوڕی موسلیمی بۆ جەنگ لەگەڵ موقەنەع هەڵبژارد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەهدی، ئیسماعیلی لەفەرمانداری کوفە لابرد و ئیسحاق کوڕی سەباحی کێندی ئەشعەسی و یا بەوتەیەك عیسا کوڕی لوقمان کوڕی محەممەد کوڕی حاتەبی جومەحی وەك فەرمانداری ئەو شارە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا مەهدی، سەعید کوڕی دەعلەجی لەفەرماندەی پاسەوانەکانی بەسرە و عوبەیدالله کوڕی حەسەنی لەپێشنوێژی بەسرە لابرد و لەجیاتی ئەو دووانە عەبدولمەلیك کوڕی ئەیووب کوڕی زەبیانی نەمیری هەڵبژارد. فەرمانی پێدا بۆ لێکۆڵینەوە لەسکالاّکان لەسەعید کوڕی دەعلەج دادپەروەری بکاتە پیشە. دواتر لێکۆڵینەوە لەم ڕووداوانە بە عومارە کوڕی حەمزە سپێردرا و ئەویش میسوەر کوڕی عەبدواللەی باهلی بۆ ئەم کارە راسپارد.

لەم ساڵەدا قوسەم کوڕی عەباس لەفەرمانداری یەمامە دوورخرایەوە و کاتێك فەرمانی لەسەر کار لابرانی بەدەست گەیشت کەمردبوو. مەهدی، بیشر کوڕی مونزەری بوجلی لەجێگەکەی ئەودانا.

لەم ساڵەدا مەهدی، هەیسەم کوڕی سەعیدی لەفەرمانداری جەزیرە دوورخستەوە و فەزڵ کوڕی ساڵحی لەجێگەی ئەو دانا.

لەم ساڵەدا مەهدی، خەیزوران دایکی مناڵی ئازاد کرد کەکەنیزی خۆی بوو. ئەوی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد بەهەمان شێوە کەدایکی عەبدوالله کچی ساڵح کوڕی عەلی و خوشکی فەزل و عەبدولمەلیکی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

لەم ساڵەدا لەنزیك کۆشکی عیسا لەبەغداد چەندین کەشتی بەبارەکانیانەوە سووتان و خەڵکانێکی زۆر بوونە پارووی ئاگر.

لەم ساڵەدا مەتەر موالی مەنسور لەفەرمانداری میسر دوورخرایەوە و باوکی زومرە محەممەد کوڕی سلێمان جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی محەممەد شەڕی هاوینەی لەگەڵ ڕۆمییەکان ئەنجامدا. لەم جەنگەدا حەسەن وەسەیف لەپێشەوەی سوپاکەدا بوون. ئەوان گەیشتنە ئەنقەرە و دەستیان بەسەر یەکێك لەشارەکانی ڕۆمدا گرت و هەنبارێکی گەنمییان دۆزییەوە. لەم ڕووبەڕوو بوونەوە زیان بەهیچ کام لەموسوڵمانان نەگەیشت و هەمووان تەندروست گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا حەمزە کوڕی یەحیا فەرمانداری سیستان و جبرائیل کوڕی یەحیا فەرمانداری سەمەرقەندی گرتەدەست. جبرائیل دیوار و خەندەکەی سەمەرقەندی هەڵکەند.

لەم ساڵەدا عەبدسەمەد کوڕی عەلی لەفەرمانداری مەدینە دوورخرایەوە و محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی کەسیری جێگەی ئەوی گرتەوە. دواتر مەهدی ئەوی لابرد و محەممەد کوڕی عوبەیداللە کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی سەفوانی جومەحی لەجێگەی ئەودانا.

لەم ساڵەدا مەهدی بناغەی بورج و مزگەوتی روسافەی داڕشت و خەندەکەی هەڵکەند.

لەم ساڵەدا مەعبەد کوڕی خەلیلب کارگوزاری مەهدی لەسند مرد و مەهدی لەسەر پێشنیاری باوکی عوبەیداللەی وەزیر، ڕوەح کوڕی حاتەمی لەجێگەی ئەو دانا.

لەم ساڵەدا مەهدی زیندانییەکانی مەنسوری ئازاد کرد مەگەر ئەو کەسانەی خوێن یا قەرزیان لەملدا بوو یارێگەی خراپەکارییان گرتبووە بەر. لەناو ئازاد کراوەکان یەعقوب کوڕی داوود موالی مناڵەکانی سولەیم دەبینرا.

لەم ساڵەدا حومەید کوڕی قەحتەبە، فەرمانڕەوای خوراسان مرد و مەهدی، باوکی عەون عەبدولمەلیك کوڕی یەزیدی لەجێگەی ئەو دانا.

لەم ساڵەدا یەزید مەنسور خاڵی مەهدی سەرپەرەستی ڕێ ورەسمی حەجی گرتە ئەستۆ. ئەو لەو کاتەدا لەیەمەنەوە هاتبوو. چوونکە فەرمانی پێدابوو سەرپەرەستی حەج کردن لەو ساڵەدا لەئەستۆ بگرێت.

فەرمانداری مەدینە لەم ساڵەدا عەبدوڵلە کوڕی سەفوانی جومەحی بوو.

سەرکردەی پاسەوانەکانی کوفە ئیسحاق کوڕی سەباحی کێندی و سەرپەرەستی گەنجخانە سابت کوڕی موسا و سەپەرەستی دامەزراوەی داد شەریك و پێشنوێژی بەسرە عەبدولمەلیك کوڕی ئەییووب و سەرکردەی پاسەوانەکانی ئەو شارە عومار کوڕی حەمزە و سەرپەرەستی دامەزراوەی داد عوبەیدالله کوڕی حەسەن و فەرمانداری گوندەکانی دیجلە و ئەهواز و پارس عومارە کوڕی حەمزە و فەرمانداری سند، بیستام کوڕی عەمرۆ و فەرمانداری یەمەن رەجا کوڕی روەح و فەرمانداری یەمامە، بیشر کوڕی مونزەر و فەرمانداری خوراسان، باوکی عەون عەبدولمەلیك کوڕی یەزید بوو کەدوای مەرگی حومەید کوڕی قەحتەب مەهدی وەك فەرمانڕەوای خوراسان هەڵیبژارد. فەرمانداری جەزیرە، فەزڵ کوڕی ساڵح و فەرمانداری ئەفریقییە، یەزید کوڕی حاتەم و فەرمانداری میسر باوکی زومرە محەممەد کوڕی سلێمان بوو.

لەم ساڵەدا شەقنا دەستی بەسەر بیابانەکانی شەنتدا گرت و عەبدولرەحمان فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. شەقنا وەك هەمیشە پەنای بۆ کوێستانەکان برد و سوپاکەی بەجێیان هێشت.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی باوکی زەئب، فەقیهی کوفە کەخەڵکی مەدینە بوو، لەتەمەنی حەفتا و نۆساڵی کۆچی دووایی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدولعەزیز کوڕی باوکی رەواد موالی موغەیرە کوڕی موهەلیب و یوسن کوڕی باوکی ئیسحاقی سوبەیعی هەمەدانی و مەخرەمە کوڕی بوکەیر کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەشجی میسری و حسەین کوڕی واقد، موالی کوڕی عامر کەسەرپەرەستی دامەزراوەی دادی مەرو بوو، کۆچی دوواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەستی کۆچی ( ٧٧٦ زایینی )

### سەردەرهێنانی یوسف بەرەم

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی ئیبراهیم ناسراو بەبەرەم لەخوراسان ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو و شوێنکەوتەکانی بەکار و کردەوەکانی مەهدی ڕازی نەبوون. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. یەزید کوڕی موزیدی شەیبانی بۆ جەنگی ئەو ڕاسپێردرا. یەزید، برازای مەعن کوڕی زائیدە بوو. ئەو ڕووبەڕووی بەرەم بوویەوە و شەڕیان تاقی کردەوە تا ئەوەی جەنگی دەستەویەخە دەستی پێکرد. یەزید بەرەمی گرفتار کرد و ڕەوانەی دەرباری مەهدی کرد و کەسە گەورەکانی هاوڕێی خۆی لەگەڵ ئەودا نارد. کاتێك گەیشتنە نەهرەوان، یوسف و هاوڕێکانیان بەشێوەی سەرەوخوار لەسەر وشترەکان دانا بەشێوەیەك سەریان لای دواوەی وشترەکەوە بوو. بەمشێوەیە ئەوانیان بردە ڕوسافە. هەردوو دەست و قاچی یوسفیان بڕی و هاوڕێکانیان کوشت و لەسەر پرد لەخاچیاندان.

وتوویانە ئەو حەروری بووە.[٢] ئەو، دەستی بەسەر بوشەنجدا گرت. فەرمانداری ئەو ناوچە موسعەب کوڕی زورەیق باوەگەورێی تاهیر کوڕی حسەین بوو و لەبەرابەر یوسف هەڵات. یوسف هەروەها توانی دەست بەسەر مەروود و تاڵەقان و جوزجاندا بگرێت. یەکێك لەهاوەڵانی باوکی موعازی فریابی بوو کە لەگەڵ ئەودا دەستگیر کرا.

### لابردنی عیسا کوڕی موسا و وەرگرتنی بەیعەت بۆ موسای هادی

دەستەیەك لەمناڵەکانی هاشم و شوێنکەوتەکانی مەهدی بۆ لەسەر کار لابردنی عیسا کوڕی موسا لەجێگری خەلافەت و وەرگرتنی بەیعەت بۆ موسای هادی کوڕی

---

[٢] حەرورییە شوێنێکە لەعێراق کەخەواریج یەکەم جار لەو شوێنە دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە

مەهدی راوێژیان کرد. کاتێك مەهدی لەم کارە ئاگادار بوویەوە، شادمان بوو و بۆ عیسا کوڕی موسا نامەیەکی نووسی کە لەگوندی روحبە لەدەوروبەری کوفە ژیانی بەسەر دەبرد و ئەوی بانگ کرد. عیسا لەمەبەستەکەی مەهدی ئاگادار بوویەوە و نەڕۆشت. مەهدی، روەح کوڕی حاتەمی وەك فەرمانداری کوفە هەڵبژارد بۆ ئەوەی زیان لەعیسا بدات. روەح هیچ پاساوێکی بۆ ئەم کارە نەدۆزییەوە چوونکە عیسا تەنیا لەرۆژانی هەینی یا رۆژەکانی جەژن و خۆشی دەڕۆشتە ناو شار.

مەهدی لەسەر مەبەستەکەی خۆی پێداگری کرد و بەعیسای وت: ئەگەر بەداواکەی من بۆ خۆ دوورخستنەوە لەجێگری خەلافەت لەبەرژەوەندی موسا و دوای ئەو هارون وەلام نەدەیتەوە، ئەو بەلات بەسەر دێنم کە بەسەر سەرکێش و یاخییەکانی دەهێنم. بەلام ئەگەر وەلامم بدەیتەوە لەبەرابەردا سوودێکی زیاترت پێ دەبڕێت. دووبارە عیسا نەڕۆشتە لای. ئەوان لەشۆڕشی عیسا ترسان. مەهدی، عەباس کوڕی محەممەدی مامی بەناو ێیەك بۆ لای ئەو نارد و بانگی کرد بەلام عیسا رازی نەبوو بڕواتە لای مەهدی. کاتێك عەباس بەبێ عیسا گەڕایەوە، مەهدی باوکی هورەیرە محەممەد کوڕی فروخی لەگەڵ هەزار کەس لەشوێنکەوتە زاناکانی بۆ لای عیسا نارد و یەکی تەپڵێکی بەهەرکامیاندا و فەرمانی پێدان لەکاتی گەیشتنە لای عیسا دەست بەلێدانی تەپڵەکان بکەن. ئەوان بەرەبەیان گەیشتنە لای عیسا و دەستیان لەلێدانی تەپڵەکان کرد. عیسا ترسا. باوکی هورەیرە ڕۆشتە لای و فەرمانی پێدا لەگەڵی بڕوات. عیسا خۆی بەنەخۆش نیشاندا بەلام باوکی هورەیرە رازی نەبوو و ئەویَ لەگەڵ خۆیدا برد.

کاتێك عیسا کوڕی موسا هات، لەئوردووگاکەی مەهدی ڕۆشتە ماڵی محەممەد کوڕی سلێمان. چەند رۆژێك لەویَ مایەوە و هاتوچۆی مەهدی دەکرد بێ ئەوەی باسی جێگری خەلافەت بکەن یا بەشێوەیەکی ناپەسەند هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکرێت. رۆژێك پێش دانیشتنی مەهدی لەشوێنی تایبەت دانیشتبوو و لایەنگرانی لابردنی عیسا لەویَ ئامادە بوون. ئەوان لەو کاتەدا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر عیسا و عیسا دەرگاکەی لەسەر داخستن. دەرگاکەیان شکاند لەکاتێکدا بەناشیرینترینی وشەکان عیسایان جوێنباران دەکرد. مەهدی ئەم کارەی ئەوانی

بەقێزەون لەقەڵەمدا بەڵام ئەم دەستەیە دەستبەرداری کارەکەیان نەبوون و چەند ڕۆژێك بەوشێوەیە مانەوە (گەمارۆیان خستە سەر عیسا) تا ئەوەی چەند کەس لەگەورەکانی منالەکانی عەباس نێوەنجیگەرییان کرد. محەممەد کوڕی سلێمان زیاتر لەهەمووان پێداگری دەکرد.

مەهدی پێداگری دەکرد و عیسا ڕازی نەدەبوو، دەیوت: بۆ ڕێزگرتن لەجێگری خەلافەت، ماڵ و منالی خۆم لەگرێوی سوێندەکەم داناوە. مەهدی چەندین قازی و فەقیهی شارەزای کۆکردەوە کە محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عولاسە و موسلیم کوڕی خالیدی زەنجی لەناویاندا دەبینران. ئەوان فیتوایاندا و ئەو دەست بەرداری خەلافەت بوو. مەهدی دەهەزار درهەم و چەندین ئاوەدانی لەزاب و کەشکەر پێدا و ئەو چوار ڕۆژ بۆ کۆتایی موحەرەم/ ١٣ نۆڤەمبەری ٧٧٨ زایینی خۆی لەخەلافەت دوورخستەوە و لەگەڵ مەهدی و موسای هادی بەیعەتی بەست.

ڕۆژی دواتر مەهدی دانیشت و بنەماڵەکەی خۆی کۆکردەوە و بەیعەتی لێوەرگرتن. دواتر لەگەڵ عیسا ڕۆشتە مزگەوت و وتارێکی بۆ خەڵکان خوێندەوە. لەوتارەکەدا لەسەر کار لابرانی عیسا و بەیعەت لەگەڵ هادی بەهەمووان ڕاگەیاند و هانیدان بەیعەت لەگەڵ هادی ببەستن. خەڵکان بەیعەتیان بەست و بوونە شایەت بۆ ئەو کارە. یەکێك لەشاعیرەکان هۆنراوەیەکی هەیە بەمشێوەیە:

کره الموت ابو موسى و قد    كان فى الموت نجاة و كرم

خلع الملك و اضحى ملبسا    ثوب لوم ما ترى منه القدم

واتاکەی: باوکی موسا مەرگی بەناخۆش دەزانی لەکاتێکدا مەرگ بۆ ئەو ڕزگاری بەدوواوە بوو. ئەو خۆی لەخەلافەت دوورخستەوە و بەمشێوەیە جل و بەرگی ڕیسوایی لەبەر کرد کە تا نووکی پێی داپۆشی.

## گرتنی شاری باربەد

لەساڵی ٧٧٥/١٥٩ زایینی مەهدی هێزی دەریایی بەفەرماندەیی عەبدولمەلیك کوڕی شەهبای مەسمەعی بەرەو هیند ڕەوانە کرد. جەنگاوەر و ژمارەیەکی زۆر لەپێشەنگەکان هاورێیەتی عەبدولمەلیکیان دەکرد کەرەبیع کوڕی سوبەیح

لەناویاندا دەبینرا. ئەوان ڕێگەیان بڕی تا لەباربەد دابەزین وگەمارۆیان خستەسەر. جەنگاوەران یەکتریان بۆ جەنگ هاندەدا. خەڵکانی ئەو سەرزەمینەیان خستە تەنگانەوە و خواوەند دەرگاکانی ئەو سەرزەمینەی بۆ کردنەوە. خەڵکەکەی پەنایان بردە پەرسگاکەیان بەڵام موسوڵمانان ئاگریان تێبەردا و بەمشێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەوان سووتان ئەوانی دیکەیان کوژران. لەم جەنگەدا تەنیا بیست و چەند کەس لەموسوڵمانان کوژران. خواوەند ئەو سەرزەمینەی کردە تالانی موسوڵمانان. لەم کاتەدا دەریا خرۆشا و موسوڵمانان چاوەڕوانی ئارام بوونەوەی دەریایان دەکرد بەڵام گرفتاری جۆرە نەخۆشییەك لەناو دەمیاندا بوون. نزیکەی هەزار کەس لەوان و لەناو ئەوان ڕەبیع کوڕی سوبەیح مردن و ئەوانیتر گەڕانەوە.

کاتێك گەیشتنە بەستێنەکانی پارس کەپێیان دەوت دەریای حومران، شەوانە تۆفان بەسەر ئەواندا هەڵیکرد و هەموو کەشتییەکانی لەناو برد. دەستەیەك لەموسوڵمانان خنکان و دەستەیەکی دیکەیان ڕزگاریان بوو.

وتوویانە: لەم ساڵەدا ئەبان کوڕی سەدەقە بووبە ڕاوێژکار و وەزیری هارون. بەهۆی توورە بوون و کینە، باوکی ئەعوەنی لەفەرمانداری خوراسان دوور خستەوە و موعاز کوڕی موسلیم جێگەی ئەوی گرتەوە. لەم ساڵەدا سومامە کوڕی عەبەس لەهاویندا شەڕی کرد و غەمر کوڕی عەباسی خەسعەمی لەدەریای مەدیتەرانە جەنگا.

## گەڕاندنەوەی پەیوەندی خزمایەتی بنەماڵەی ئەبوبەکرە و بنەماڵەی زیاد

لەم ساڵەدا مەهدی فەرمانیدا پەیوەندی خزمایەتی بنەماڵەی ئەبوبەکر لەسەقیف بگێڕنەوە و خزمایەتی ئەوان بە پێغەمبەر (د.خ) بگەیێنن چوونکە پیاوێك لەبنەماڵەی ئەبوبەکر، لای مەهدی سکاڵای کرد و لەبەر ڕووناکی خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) خۆی لەو نزیك کردەوە. مەهدی پێی وت: بەم خزمایەتییە شانازی ناکەن مەگەر لەکاتی نیاز و پەرێشانی تا خۆتان لەئێمە نزیك بکەنەوە. ئەو پیاوە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! چ کەسێك بەم وتەیە ڕازی نابێت، ئێمەی پێی ڕازی نین و داوات لێدەکەین پەیوەندی ئێمە و بنەماڵەی ئەبوبەکر بۆ پێغەمبەر

(د.خ) بگەڕێنیتەوە و فەرمان بەبنەماڵەی زیاد بدەیت پەیوەندی خۆیان لەگەڵ منالەکانی سوفیان بپچڕێنن. ئەوان بەداوەری کردنی پێغەمبەر (د.خ) رازی نەبوون چوونکە ( منال، تایبەتە بەو جێگەی تۆوی لێ دەچێنرێت و ژنی گاییراو، پێویستە سەنگسار بکرێت) و بەم شێوەیە پەیوەندی خزمایەتی خۆیان بۆ عوبەید (لەموالییەکانی سەقیف) گەڕاندەوە.

مەهدی فەرمانیدا بنەماڵەی ئەبوبەکر پەیوەندی خزمایەتی خۆیان بۆ پێغەمبەر (د.خ) بگێڕنەوە. ئەم هەواڵەی بۆ محەممەد کوڕی موسا نووسی و فەرمانی پێدا هەرکەس لەوان بەم فەرمانە رازی ببێت سامانەکەی بۆ بگێڕنەوە و هەرکەس رازی نەبوو دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرن. محەممەد کوڕی موسا ئەم هەواڵەی پێ راگەیاندن و جگە لەسێ کەس هەمووان پێی رازی بون. هەروەها فەرمانیدا پەیوەندی خزمایەتی بنەماڵەی زیاد بۆ عوبەید بگێڕنەوە و پەیوەندییان لەگەڵ قورەیشییەکان بپچڕێنن.

ئەوەی مەهدی بۆ ئەم کارە هاندا – جگە لەوەی باسی کرا– ئەوە بوو پیاوێك بەناوی سەغدی کوڕی سەلەم کوڕی حەرب کوڕی زیاد ڕۆشتە لای مەهدی. مەهدی پرسی: کێیت؟ وەلامی دایەوە: کوڕی مامی تۆم؟. مەهدی پرسی: کام کوڕە مام؟ ئەو رەچەڵەکی خۆی باس کرد. مەهدی ئەوی بەکوڕی سومەییە گاییراو ناو برد و رازی نەبوو کوڕە مامی بێت. فەرمانیدا یەخەی بگرن و دەری بکەن. مەهدی پرسی: چۆن پەیوەندی زیاد بۆ ئەم کەسە دەگێڕنەوە؟ نامەیەکی بۆ کارگوزاری بەسرە نووسی و فەرمانی پێدا بنەماڵەی زیاد و رەچەڵەك نامەی ئەوان لەریزی قورەیشییەکان دوور بکەنەوە و پەیوەندی ئەوان بۆ سەقیف بگێڕنەوە. ئەو لەمبارەوە نامەیەکی راشکاوی نووسی و پەیوەندی زیادی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) روون کردەوە. بەمشێوەیە پەیوەندی ئەوان لەگەڵ قورەیشییەکان پچڕا بەلام ئەوان دواتر بەرتیلیان بەکارگوزارەکاندا و دووبارە ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ پێغەمبەر (د.خ) گەڕاندەوە. خالید کوڕی نەجار سەبارەت بەوان هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

ان زیادا و نافعا و ابا    بکرة عندی من اعجب العجب

ذا قرشی کما یقول و ذا    مولی و هذا بزعمه عربی

واتاکەی: بەسەرهاتی زیاد و نافیع و ئەبوبەکر (کەهەر سێکیان برا بوون) لەسەرسوڕهێنەرترینی سەرسوڕهێنەرەکانە. ئەمیان وەك دەڵێت قوڕەیشییە و ئەوی دیکەیان موالی و سێیەمی خۆی بەعەرەب دەزانێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی سەفوانی جومەحی، فەرمانداری مەدینە مرد و محەممەد کوڕی عەبدوالله کەسیری جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەویش لەسەر کار لابرا و زوفەر کوڕی عاسمی هیلالی جێگەی گرتەوە. عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عومرانی تەڵحی سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی مەدینەی گرتە ئەستۆ.

لەم ساڵەدا عەبدئەلسلانی خارجی لەدەوروبەری موسڵ ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە.

لەم ساڵەدا بیستام کوڕی عەمرۆ فەرمانداری سندی لێ سەندرایەوە و ڕوەح کوڕی حاتەم جێگەی گرتەوە. لەم ساڵەدا مەهدی خۆی سەرپەرەستی ڕێ ورەسمی حەجی گرتە ئەستۆ و کوڕەکەی خۆی موسای کردە جێگری خۆی لەبەغداد و خاڵۆی یانی یەزید کوڕی مەنسوری وەك ڕاوێژکاری ئەو دیاریکرد. لەم سەفەری مەهدی بۆ مەککە دەستەیەك لەبنەماڵەکەی ئەو و کوڕەکەی هارون ڕەشید و یەعقوب کوڕی داوود هاوڕێیەتیان دەکرد. یەعقوب لەمەککە، حەسن کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالڵەی عەلەوی بردە لای مەهدی کەداوای ئەمانی کردبوو. مەهدیش سامان و زەوی پێ بەخشی.

لەم ساڵەدا مەهدی پەردەی کەعبەی هەڵگرت و پەردەیەکی تازەی پیاهەڵواسی. هۆکارەکەی وەك دەڵێن ئەوە بوو پەردەدارەکانی کەعبە ترسی خۆی لەداڕمان بەهۆی قورسی پەردەکانەوە بەمەهدی ڕاگەیاند و مەهدیش پەردەکانی لێکردەوە. پەردەکەی خوشام کوڕی عەبدولمەلیك لەحەریری ئەستور بوو. پەردەی پێش ئەو دەستکاری یەمەن بوو.

مەهدی لەم سەفەرەی سامانێکی زۆری بەخشی. ئەو لەعێراقەوە لەگەڵ خۆی سێ هەزار هەزار درهەمی هەڵگرت و لەمیسرەوە سێسەد هەزار دیناری بەدەست

گەیشت، لەیەمەنەوە دووسەد هەزار دینار و هەمووی بەم و بەو بەخشی بەشێوەیەك سەد و پەنجا هەزار دەست جل و بەرگی لەناو موسوڵمان دابەش کرد. ئەو مزگەوتی پێغەمبەری فراوان کرد و پێنسەد کەسی لەئەنسارییەکان هەڵبژارد تا لەعێراق پارێزگاری لیٚ بکەن. مەهدی لەعێراق زەوی بەم پێنسەد کەسە بەخشی و رۆژانەی بۆ دیاری کردن.

محەممەد کوڕی سلێمان بۆ مەهدی سەهۆڵی نارد و ئەو یەکەم خەلیفە بوو سەهۆڵیان بۆ ناردە مەککە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سلێمان، فەرمانداری بەسرە وناوچەکانی دیجل و بەحرەین و عەمان و گوندەکانی ئەهواز و فارس بوو. موعاز کوڕی موسلیم فەرمانداری خوراسان و کارگوزاری ناوچەکانی دیکە هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی لەئاندۆلۆس، عوسمان کوڕی عوبەیداللە کوڕی عوسمان و تەمام کوڕی عەلقەمەی بۆ جەنگی شەقنا ڕەوانە کرد و ئەو دوانە بۆ ماوەی چەند مانگ لەقەڵای شەبتەران گەمارۆیان خستە سەر شەقنا بەڵام نەیانتوانی بیگرن و بەناچاری گەڕانەوە. دوای گەڕانەوەی ئەو دووانە شەقنا لەشەبتەرانەوە بەرەو یەکێك لەگوندەکانی شەنت بەرییە بەرێکەوت. ئەو سوار لەسەر ئێسترەکەی خۆی بەناوی (خولاصە) ڕێگەی دەبڕی کە لەناکاو باوکی مەعن و باوکی خوزەیم، دووان لەهاوەڵانی، هێرشیان کردەسەر و کوشتیان و هاوریٚ لەگەڵ سەرە بڕاوەکەی خۆیان گەیاندە عەبدولرەحمان و بەمشێوەیە خەڵکان لەشەڕ و بەڵای ئەو ئاسوودە بوون.

لەم ساڵەدا داوود کوڕی نوسەیری تائی لەهاوەڵانی باوکی حەنیفە و عەبدولرەحمان کوڕی عەبدوڵلە کوڕی عوتەبە کوڕی عەبدوڵلە کوڕی مەسعودی مەسعودی و شوعبە کوڕی حەجاج، باوکی بێستامی سەبیعی هەموویان مردن. وتوویانە ئیسرائیل کوڕی باوکی ئیسحاق لەساڵی ١٦٤/ ٧٨٠ زایینی مردووە.

لەم ساڵەدا رەبیع کوڕی مالك کوڕی باوکی عامر مامی مالك کوڕی ئەنس بەنازناوی باوکی مالك کۆچی دووایی کرد. ئەوان چوار برا بوون کەئەنس باوکی

مالك، برا گەورەی ئەوان بوو. دوای ئەو ئەویس باوەگەوڕێی ئیسماعیل کوڕی ئەویس و دوای ئەو نافیع و سەرئەنجام رەبیع کەبرا بچووکی ئەوان بوو.

لەم ساڵەدا خەلیفە کوڕی خەیاتی عوسفوری لەیسی باوەگەوڕێی خەلیفە کوڕی خەیات مرد.

لەم ساڵەدا خەلیل کوڕی ئەحمەدی بەسرەی فەرهودی نەحوی، پێشەوای نەحو و ماموٚستای سیبویە مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست و یەکی کۆچی( ٧٧٧ زایینی )

## چۆنیەتی لەناوچوونی موقەنەع

لەم ساڵەدا موعاز کوڕی سەلەم و دەستەیەك لەفەرماندەکان و سوپاییەکان هێرشیان کردە سەرموقەنەع. پێشەنگی ئەوان سەعیدی حەرەشی بوو. عوقەبە کوڕی موسلیم لەزەمەوە وەك هێزی پشتیوان هات و لەتەواویس کۆبوونەوە و شەڕ لەگەڵ هێزەکانی موقەنەع دەستی پێکرد. ئەوان توانییان شکست بەهێزەکانی موقەنەع بێنن و هاوەڵە سەرنەکەوتووەکانی موقەنەع، مەبەستی ئەویان لەسەنام کرد. ئەو، لەوێ خەندەکی هەڵکەند و قەڵایەکی دروست کرد. موعاز هێرشی کردە سەریان بەڵام لەنێوان ئەو حەرەشی ناسازگاری هاتە ئاراوە. حەرەشی نامەیەکی بۆ مەهدی نووسی و خراپەی موعازی هێنایە سەرزمان و ئاگاداری کردەوە ئەگەر تەنیا خۆی بۆ جەنگی موقەنەع دەستنیشان بکات، بەسە. مەهدی بەداواکەی ڕازی بوو وحەرەشی لەگۆڕەپانی جەنگەکە بەتەنیا مایەوە. موعاز کوڕەکەی خۆی بەناوی ڕەجای لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ هاوکاری حەرەشی ڕەوانە کرد. گەمارۆدانی موقەنەع درێژەی کێشا. هاوەڵانی موقەنەع بەشێوەیەکی نهێنی داوای ئەمانیان لەحەرەشی کرد و ئەو ڕازی بوو. بەمشێوەیە نزیکەی سی هەزار کەس موقەنەعیان بەجێهێشت و تەنیا دوو هەزارکەس لەهاوەڵە تێکەیشتووەکانی لەدەوری مانەوە. ڕەجا کوڕی موعاز لەگەڵ هێزەکانی دیکە خۆیان گەیاندە خەندەکانی موقەنەعت و بارودۆخیان لێ دژوار کرد.

موقەنەع کاتێك لەکوژرانی خۆی دڵنیا بوو، ژنان و کەسەکانی خۆی کۆکردەوە و ژەهر خواردی کردن. هەموویانی کوشت و فەرمانیدا خۆی بسووتێنن تا دوژمن دەستی بەجەستەکەی نەگات. وتوویانە: هەموو شتەکانی ناو قەڵاکەی بەچوارپێکانیشەوە سووتاند. دەیوت: هەرکەس دەخوازێت لەگەڵ من بۆ ئاسمان بێت، لەگەڵ من خۆی بخاتە ناو ئەم ئاگرەوە. خۆی و ژن و منداڵەکانی خستە ناو ئاگرەوە و هەموویان سووتان. کاتێك سوپاکەی حەرەشی ڕۆشتە ناو قەڵاکە،

بینیان چۆڵە و هیچی تیا نەماوە.

ئەم ڕووداوە باوەڕی زۆربەی هاوەڵانی ئەوی لەماوەرا ئەلنەهر قوڵتر کرد بەڵام باوەڕەکەی خۆیان دەشاردەوە. وتوویانە: ئەو خۆیشی ژەهر خوارد کرد و حەرەشی سەری ئەوی بۆ مەهدی نارد. مەهدی لەساڵی ٧٧٩/١٦٣ زایینی لەحەلەب لەکاتێکدا سەرقاڵی جەنگەکانی خۆی بوو، سەری موقەنەعی بەدەست گەیشت.

## گۆڕینی پێگەی باوکی عوبەیدالله

لەم ساڵەدا پێگەی باوکی عوبەیدالله وەزیری مەهدی گۆڕانی بەسەردا هات. پێشتر چۆنیەتی پەیوەندی ئەو لەگەڵ مەهدیمان لەڕۆژگاری مەنسور و هاوڕێ بوونی ئەومان لەڕۆشتن بۆ خوراسان لەگەڵ مەهدی باس کرد. فەزل کوڕی ڕەبیع دەڵێت موالییەکان لای مەهدی باسی باوکی عوبەیداللەیان دەکرد و دژی ئەو هانیان دەدا. نامەکانی باوکی عوبەیدالله بەمەنسور دەگەیشت و لەکارەکانی ئاگاداری دەکردەوە. مەنسور نامەکانی بەرەبیع نیشان دەدا. رەبیعیش هاوشێوەی نەیارەکانی باوکی عوبەیدالله هانی دەدا و داوای لێدەکرد گرنگی بەم وتانە بدات.

ڕەبیع لەکاتی مەرگی مەنسور لەگەڵ ئەو حەجی کرد و لەوەرگرتنی بەیعەت بۆ مەهدی ئەو کارەی کرد کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. کاتێك رەبیع گەیشتە بەغداد، پێش سەردانی مەهدی و بنەماڵەکەی خۆی سەردانی باوکی عوبەیداللەی کرد. فەزل کوڕی رەبیع پێی وت: دیداری سەروەری باوەڕداران و بنەماڵەکەی خۆت پشتگوێ دەخەیت و دەڕۆیتە سەردانی باوکی عوبەیدالله؟ ڕەبیع وەڵامی دایەوە: ئەو لەکەسە نزیکەکانی مەهدییە و شیاوە بەمشێوەیە هەڵس وکەوتی لەگەڵ بکرێت و بۆ هاوکاری کردنی ئەو لەهیچ شتێك دریغ نەکەین.

رەبیع لەسەرەتای ئێواریێ تا کۆتایی نوێژەکەی دیکە لەبەردەرگای ماڵی باوکی عوبەیدالله وەستا تا مۆڵەتی ڕۆشتنە ژوورەوەیان پێدا. کاتێك ڕۆشتە ناو ماڵەکە، باوکی عوبەیدالله بۆ ڕێزگرتن لەو لەشوێنەکەی هەڵنەستا و پاڵی دابوویەوە. باوکی عوبەیدالله سەیری رەبیعی نەکرد. رەبیع مەبەستی ئەوەی کرد بەسەرهاتی وەرگرتنی بەیعەت بۆ مەهدی بۆ باس بکات بەڵام باوکی عوبەیدالله وتی: هەواڵی

کارەکەتم بیستووە. بەمشێوەیە ڕەبیع کینەی ئەوی لەدڵ گرت. کاتێك ماڵەکەی بەجێهێشت، فەزلی کوڕی پێی وت: ئەم پیاوە دەسەڵاتی بەوشێوەیە بەرز بۆتەوە کەبەو شێوەیە هەڵس و کەوت لەگەڵ تۆ دەکات. بۆچوونی ڕاست ئەوەبوو سەرەتا بۆ سەردانی ئەو نەدەهاتیت یا ئەو کاتەی مۆڵەتی ڕۆشتنە ژوورەوەی پێ نەدایت، دەگەڕایتەوە یا ئەو کاتەی بۆ ڕێز گرتن لەتۆ لەشوێنەکەی هەڵنەستا، دەهاتیتەدەر. ڕەبیع لەوەڵامی کوڕەکەی وتی: وتەکانی تۆ هەمووی لەنەزانیی‌یەوە سەرچاوە دەگرێت. کاری شیاو ئەوە بوو کەخۆم کردم بەڵام سوێند بەخوا و هەزار جار سوێند بەخوا پێگە و هەموو سامانی خۆم بەکار دەبەم تا ڕۆژی دەری ئەو بکەمە بکوژی ئەو.

ڕەبیع بۆ بەئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەی زۆری هەوڵدا بەڵام سوودی نەبوو چوونکە باوکی عوبەیدالله کەسێکی وشیار بوو. لەبەر ئەمە لەرێگەی محەممەد کوڕی عوبەیداللەوە دەستی پێکرد و بەردەوام لای مەهدی خراپەی دەهێنایە سەرزمان. سەرئەنجام ئەو تۆمەتەی بۆ هەڵبەست کەپەیوەندی لەگەڵ یەکێك لەپەردەدارەکانی ئەودا هەیە، هەروەها گوناحی ناباوەڕی بۆ هەڵبەست تا ئەوەی دڵی مەهدی ڕەش کرد. فەرمانیدا محەممەد بێنن و باوکی لەدەرەوە ڕابگرن. دواتر پێی وت: ئەی محەممەد بخوێنە بەڵام ئەو نەیتوانی بەباشی بخوێنێت. مەهدی باوکی بانگ کرد و پێی وت: ئایا پێت نەوتم محەممەد قورئانی لەبەرە؟ باوکی عوبەیدالله وتی: بەڵێ بەڵام چەند ساڵێکە لەمن دوور کەوتۆتەوە و لەبیری کردووە. مەهدی بەباوکی عوبەیداللەی وت: هەنووکە هەستە و بەڕشتنی خوێنی کوڕەکەت خۆت لەخواوەند نزیك بکەرەوە. باوکی عوبەیدالله هەستا تا خوێنی کوڕەکەی بڕێژێت بەڵام قاچی خلیسکا و کەوت. عەباس کوڕی محەممەد بەمەهدی وت: ئەگەر دەکرێت لەدواهاتەکانی کاری ئەم پیرە پیاوە چاوبپۆشە. مەهدی ڕازی بوو و فەرمانیدا جەلاد سەری محەممەد بپڕێت. ڕەبیع بەمەهدی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران ئایا کوڕەکەی دەکوژیت و لەو ئاسوودەیت؟ ئەوە شیاو نییە. بەمشێوەیە مەهدی ترسی باوکی عوبەیداللەی کەوتە دڵ و ئەو بەڵای بەسەردا هێنا کەدواتر باسی دەکەین.

## ڕۆشتنی سەقلەبی بۆ ئاندۆلۆس و کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا یا بەوتەیەك لەساڵی ٧٧٦/١٦٠ زایینی عەبدولڕەحمان کوڕی حەبیبی فێهری ناسراو بەسەقلەبی لەئەفریقییەوە بەمەبەستی جەنگ ڕووی لەئاندۆلۆس کرد. بۆیە بەو نازناوە بانگیان دەکرد چوونکە بەژن بەرز، سوور باو و چاوشین بوو. دەیویست ئاندۆلۆسییەکان ناچار بەفەرمانبەری بنەماڵەی عەباس بکات. لەکەنارەکانی تەدمور گوزەری کرد. نامەی بۆ سلێمان کوڕی یەقزان نووسی تا هاورێیەتی بکات و شەڕ لەگەڵ عەبدولڕەحمانی ئومەوی بکات و پێشنیاری فەرمانبەری مەهدی پێکرد.

سلێمان لەبەرشەلۆنە (بارسلۆن) ژیانی بەسەر دەبرد و وەڵامی نەدایەوە. سەقلەبی کینەی ئەوی لەدڵ گرت و لەگەڵ سوپاکەی خۆی مەبەستی هێرش کردنە سەر سەرزەمینەکەی ئەوی کرد بەڵام سلێمان توانی شکستی پی بێنێت و سەقلەبی بۆ تەدمور گەڕایەوە. عەبدولڕەحمانی ئومەوی لەگەڵ سوپایەکی تەیار هێرشی کردە سەر سەقلەبی و بۆ ڕێگرتن لەهەڵاتنی سەقلەبی کەشتییەکانی ئەوی سووتاند. سەقلەبی پەنای بۆ کێوێکی بەرز بەناوی بەلەنسیە (والنسیا) برد. عەبدولڕەحمانی ئومەوی هەزار دیناری وەك خەڵات بۆ ئەو کەسە دیاری کرد کەسەری سەقلەبی بۆ دەبات. پیاوێکی بەربەری سەقلەبی کوشت و سەری ئەوی بردە لای عەبدولڕەحمان و هەزار دینار خەڵاتەکەی وەرگرت. کوژرانی سەقلەبی لەساڵی ٧٧٨/١٦٢ زایینی ڕوویدا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی ئەشعەس لەشام بەسەر عەبدوڵڵە کوڕی مەروان سەرکەوت و ئەوی دەست بەستراو بردە لای مەهدی. مەهدی ئەوی لەموتبەق زیندانی کرد. عەمرۆ کوڕی سەهلەی ئەشعەری بانگەشەی ئەوی کرد کە عەبدوڵڵە باوکی ئەوی کوشتووە. ئەو دادی بردە لای عافیەی قازی و عافیە فەرمانی کوشتنی عەبدوڵڵەی دەرکرد. لەم کاتەدا عەبد عەزیز کوڕی موسلیمی عوقەیلی ڕۆشتە لای قازی و وتی:

عەمرۆ کوڕی سەهلە درۆ دەکات کەدەڵێت عەبدوڵڵە باوکی ئەوی کوشتووە. سوێند بەخوا کەس جگە لەمن باوکی ئەوی نەکوشتووە. من بەفەرمانی مەروان ئەوم کوشت و عەبدوڵڵە هیچ گوناحێکی نییە. عەبدوڵڵە ئازاد کرا و مەهدی زیانی بە عەبدعەزیز نەگەیاند چوونکە بەفەرمانی مەروان خوێنی باوکی عەمرۆی ڕشتبوو.

لەم ساڵەدا تومامە کوڕی وەلید جەنگی هاوینەی کرد و لەدابق ئوردووی لێدا. بەم کارەی ڕۆمییەکان تووڕە بوون و بەسوپایەکی هەشتا هەزار کەسی بەفەرماندەیی میخائیل هێرشیان کردە سەر دۆڵی مەرعەش. میخائیل وێرانی کرد و ئەسیری گرت و درهەم و دیناری فڕاند. تومامە گەمارۆی خستەسەر و بۆ شەڕی ئەوان خۆی ئامادە کرد. ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان کوژران. عیسا کوڕی عەلی بۆ پارێزگاری کردن لەقەڵای مەرعەش خۆڕاگری کرد و بەمشێوەیە ڕۆمییەکان ڕوویان لەجەیحان کرد. ئەم هەواڵە بەمەهدی گەیشت و بۆ ئەو دژوار بوو. سوپایەکی بۆ جەنگی ڕۆمییەکان کۆکردەوە کەچۆنیەتی و چەندایەتی ئەو سوپایە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٧٧٨/١٦٢ زایینی باس دەکەین. موسوڵمانان لەو ساڵەدا چیتر لەهاویندا شەڕیان نەکرد.

لەم ساڵەدا مەهدی فەرمانیدا لەسەر ڕێگەی مەهدی چەندین مەنزڵ دروست بکەن کەگەورەتر لەو مەنزڵگانە بێت کە سەفاح لەسەر ڕێگەی قادسیە بۆ زوبالە دروستی کردبوو. فەرمانیدا لەهەر مەنزڵگەیەك شوێنی ئاو خواردنەوە دروست بکەن، فەرمانیدا حەوز و چاڵاوەکان نۆژەن بکەنەوە و چاڵی تازە هەڵکەنن. یەقتین کوڕی موسای بۆ ئەم کارە ڕاسپارد. مەهدی فەرمانیدا فراوانی مزگەوتی بەسرە زیاتر بکەن و مینبەرەکان لەشارەکاندا کورت بکەنەوە تا لەگەڵ مینبەرەکەی پێغەمبەر (د.خ) هاوتا بن.

لەم ساڵەدا مەهدی فەرمانی بەیەعقوبدا پیاوە ڕاست کار و ڕاست کردارەکان بۆ هەموو ناوچە ئیسلامییەکان ڕەوانە بکات. ئەویش ئەم کارەی کرد و کار گەیشتە ئەوەی مەهدی چیتر نامەی بۆ کارگوزارەکانی خۆی نەدەنارد کەئەنجامدانەکەی ڕەوا بێت مەگەر ئەوەی یەعقوب فەرمانی ئەنجامدانی ئەو کارەی بەکەسە ئەمینەکەی خۆی دەدا.

لەم ساڵەدا غەمر کوڕی عەباس لەدەریا جەنگی کرد.

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس (لەجێگەی ڕوەح کوڕی حاتەم

وەك فەرمانڕەوای سند دەستنیشان کرا. دواتر لەسەر کار لابرا و عەبد مەلیك کوڕی شە هاب جێگەی ئەوی گرتەوە و بۆ ماوەی هەژدە ڕۆژ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی بوو. ئەویش لەسەر کار لابرا و نەسر لەسەر لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت.

لەم ساڵەدا مەهدی، عافیەی قازی لەگەڵ کوڕی عولاسە بۆ سەرپەرەستی کردنی کاروباری دادی روسافە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا مەهدی فەزڵ کوڕی ساڵحی لەفەرمانڕەوایی جەزیرە دوور خستەوە و عەبد سەمەد کوڕی عەلی لەجێگەی ئەو دانا و عیسا کوڕی لوقمانی بۆ فەرمانڕەوایی میسر و یەزید کوڕی مەنسوری بۆ کارگوزاری ناوچەکانی دەوروبەری کوفە و حەسانی شەروی بۆ فەرمانڕەوایی موسڵ وبێستام کوڕی عەمرۆ تەغلەبی بۆ فەرمانڕەوایی ئازەربایەجان دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی مالك بەهۆی نەخۆشی لاواز بوونی ئەندامەکانی جەستەی کۆچی دووایی کرد و مەهدی دوای ئەو فەرماندەی پاسەوانەکان حەمزە کوڕی مالکی لەجێگەی ئەو دانا. ئەبان کوڕی سەدەقە لەراوێژکاری هارون دوورخرایەوە و یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك وەك راوێژکاری هارون دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا لەمانگی زیحەججە/ ئوتی ٧٧٩ زایینی محەممەد کوڕی سلێمان باوکی زەمرە فەرمانداری میسر لێ سەندرایەوە و سەلمە کوڕی رەجا جێگەی ئەوی گرتەوە و موسای هادی (جێگری خەلیفە) سەرپەرەستی رێ و رەسمی حەجی گرتە ئەستۆ. کارگوزاری مەککە و تاییف و یەمامە جەعفەر کوڕی سلێمان و کارگوزاری یەمەن عەلی کوڕی سلێمان و کارگوزاری ناوچەکانی دەوروبەری کوفە یەزید کوڕی مەنسور و سەرکردەی پاسەوانەکانی کوفە ئیسحاق کوڕی مەنسور بوو.

لەم ساڵەدا سوفیانی سەوری مرد. لەدایك بوونی ئەو لەساڵی ٧١٥/٩٧ زایینی بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا زائدە کوڕی قودامە باوکی سەڵتی سەقەفی کوفی و ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم کوڕی مەنسور باوکی ئیسحاقی خواپەرەست مردن. ئەو لەهۆزی بەکر کوڕی وائیل بوو کەباوکی حاتەمی بەستی ئاماژەی بەناوی ئەو داوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست و دووی کۆچی ( ٧٧٨ زایینی )

### چۆنیەتی کوژرانی باوکی سەلامی خارجی

لەم ساڵەدا عەبد سەلام کوڕی هاشمی یەشکوری لەقێنسرین کوژرا. ئەو لەجەزیرە ئالای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە. عەبدسەلام لەگەڵ دەستەیەك لەفەرماندەکانی مەهدی کەعیسا کوڕی موسا لەناویاندا دەبینرا، ڕووبەڕوو بوویەوە و ئەوی لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی کوشت. هەروەها دەستەیەك لەفەرماندەکان کەشەبیب کوڕی واج لەناویاندا بوو، لەسەر دەستی ئەو شکستیان خوارد. مەهدی فەرمانی بەهەزار جەنگاوەردا پەیوەستی شەبیب بن و هەرکام هەزار درهەمی پێدان. ئەوان ڕۆشتنە لای شەبیب و لەگەڵ ئەوان شوێن عەبدسەلام کەوت. عەبدسەلام هەڵات و شەبیب لەقینسرین ڕووبەڕووی بوویەوە و شەبیب توانی لەناوی ببات.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەهدی بۆ هەر دیوانێك بەڕێوبەرێکی دانا و عەمرۆ کوڕی مورەبەعی موالی خۆی وەك سەرپەرەستی هەموو دیوانەکان دیاریکرد.

مەهدی لەم ساڵەدا بۆ هەموو گولەکان و زیندانییەکان لەهەموو ناوچە ئیسلامییەکان ڕۆژانەی دیاریکرد.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر شاری حەدەس و دیواری شارەکەیان وێران کرد و حەسەن کوڕی قەحتەبە لەگەڵ هەشتا هەزار هێزی مووچەخۆر جگە لەخۆبەخشەکان شەڕی هاوینەی کرد و گەیشتە حەممەی ئەزرولیە. ئەو لەڕۆم چەندین ناوچەی وێران و خاپور کرد بەڵام دەستی بەسەر هیچ قەڵایەکدا نەگرت و لەگەڵ کەس ڕووبەڕوو نەبوویەوە چوونکە ڕۆمییەکان بەئەژدیها ناویان دەبرد. ئەوان دەیانوت: ئەو هاتۆتە حەممە تا بەئاوەکەی گولی لەخۆی پاك

بکاتەوە. شەڕکەرانی ئەم جەنگە تەندروست گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی ئوسیدی سولەمی لەقالیقولا (ئەرزەروم) بۆ جەنگ بەرێکەوت و سامانی زۆری دەست کەوت و دەستی بەسەر چەندین قەڵاداگرت و ژمارەیەك لەوانی ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی سلێمان لەفەرمانداری یەمەن دوورخرایەوە و عەبدوللە کوڕی سلێمان جێگەی ئەوی گرتەوە. سەلیمە کوڕی ڕەجا لەفەرمانداری میسر دوورخرایەوە و لەمانگی موحەڕەم/ سێپتامبەری ٧٧٨ زایینی عیسا کوڕی لوقمان وەك فەرمانداری میسر دەستنیشان کرا. لەجومادی الاخر/ فەوریەی ٧٧٩ زایینی ئەم ساڵە عیسا لەسەر کار لابرا و وازح، موالی مەهدی جێگەی ئەوی گرتەوە و لەزیقەعدە/ ژوئیەی ٧٧٩ زایینی ئەویش لەسەر کار دوورخرایەوە و یەحیای حەرەشی جێگەی گرتەوە.

لەم ساڵەدا سوور پۆشەکانی گورگان کەفەرماندەکەیان پیاوێك بەناوی عەبدقەهار بوو، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەستیان بەسەر ئەو ناوچەدا گرت و ژمارەیەکی زۆریان کوشت. عومەر کوڕی عەلا لەتەبەرستان ڕووبەرووی سورپۆشەکان بوویەوە و شکستی پێ هێنان و هەموویانی کوشتار کرد.

کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون کەئاماژەمان پێدان. جەزیرە لەژێر دەستی عەبدسەمەد کوڕی عەلی و تەبەرستان و ڕویان لەژێر دەستی سەعید کوڕی دەعلەج و گورگان لەژێر دەستی موهەلهیل کوڕی سەفواندا بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، شۆهەید کوڕی عیسای بۆ شەڕ لەگەڵ دەحیەی غەسانی ڕەوانە کرد کە لەیەکێك لەقەڵاکانی بیرە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە و ئەو توانی دەحیە لەناو ببات. بەهەمان شێوە بەدر، موالییەکەی خۆی بۆ جەنگی ئیبراهیم کوڕی شەجەرە ڕەوانە کرد کەئەویش ئاڵای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە. بەدر ئیبراهیمی کوشت. سومامە کوڕی عەلقەمەی بۆ جەنگ لەگەڵ عەباسی بەربەری و دەستەیەك لەبەربەرییەکان نارد چوونکە ئەوانیش شۆڕشیان کردبوو. سومامە عەباسی کوشت و بڵاوەی بەدەستەکەی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان سوپایەکی بەفەرماندەیی حەبیب کوڕی

عەبدولمەلیکی قورەشی بۆ جەنگی قائیدی سولەمی ڕەوانە کرد. قائیدی سولەمی لای عەبدولرەحمان پێگەیەکی بەرزی بوو بەلاّم شەوێك عارەقی خواردەوە و لەکاتی مەستی مەبەستی گرتنی باب ئەلقەنتەرەی کرد بەلاّم پاسەوانەکان ڕێگەی لێدەگرن و بەناچاری دەگەڕێتەوە. کاتێك لەدنیای مەستی دێتەدەر، ترس دایدەگرێت و بۆ تەڵیتەڵە (تۆڵدۆ) رادەکات و ژمارەیەکی زۆر لەتاوانبارن و جەردەکان لەدەوری کۆدەبنەوە. عەبدولرەحمان بەخێرایی سوپایەکی بۆ لەناو بردنی ئەو ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەو ناوچەی قائید سەنگەری لێدابوو، ئوردوویان لێدا و گەمارۆیان خستەسەر. سولەمی خوازیاری جەنگی دەستەویەخە بوو. کۆیلەیەکی ڕەش رووبەرووی بوویەوە. ئەوان شەڕە شمشێریان کردو لەئەنجامدا هەردووکیان کوژران.

لەم ساڵەدا ژیانی عەبدولرەحمان کوڕی زیاد کوڕی ئەنعەم سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەفریقییە کەزیاتر لەنەوەد ساڵ درێژەی کێشا، کۆتایی پێهات. هۆکاری مردنەکەی ئەوە بوو لای یەزید کوڕی حاتەم ماسی خوارد و دواتر شیری خواردەوە. یەحیا کوڕی ماسویەی پزیشك لەوێ بوو. لەم کاتەدا یەحیا وتی: ئەگەر زانستی پزیشکی راست بێت، ئەمشەو ئەو پیرە پیاوە دەمرێت. عەبدولرەحمان لەهەمان شەو مرد و خواوەند زاناترە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست وسێی کۆچی ( ٧٧٩ زایینی )

## جەنگ لەگەڵ ڕۆمییەکان

لەم ساڵەدا مەهدی بۆ جەنگ لەگەڵ ڕۆمییەکان هێزەکانی خۆی کۆکردەوە. ئەو لەبەرەدان ئوردووی لێدا و لەخوراسان و ناوچەکانی دیکەوە سوپای کۆکردەوە. لەم کاتەدا عیسا کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس لەجومادی الاخر/ فەوریە کۆچی دوایی کرد بەلاّم بۆ ڕۆژی دواتر مەهدی بەغدادی بەجێهێشت و کوڕەکەی خۆی، یانی موسای هادی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. هارون ڕەشیدی کوڕی هاورێیەتی دەکرد و لەرێگەی موسڵ و جەزیرەوە سوپاکەی خۆی بردە پێش و لەسەر ڕێگە، عەبدسەمەد کوڕی عەلی لەسەر کار لابرد.

کاتێك لەکۆشکی مەسلمە کوڕی عەبدولمەلیك نزیك کەوتەوە، عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی بەمەهدی وت: مەسەلمە ماف لەملی ئێمەدایە. کاتێك محەممەد کوڕی عەلی ڕۆشتە لای مەهدی، مەهدی چوار هەزار دیناری پێ بەخشی و وتی: هەرکاتێك ئەم پارەیە کۆتایی هات، دووبارە وەرە لای ئێمە بێ ئەوەی شەرم بکەیت. مەهدی مۆڵەتی سەردانی بەموالی و مناڵەکانی مەسلمەدا و فەرمانیدا بیست هەزار دیناریان پێ ببەخشن. ڕۆژانەی بۆ ئەوان دیاری کرد. لەرێگەی فوراتەوە بەرەو حەلەب بەرێکەوت ولەوێ هەموو زەندیقییەکانی کۆکردەوە و دوای کۆبوونەوەی ئەوان، کوشتاری کردن و بەکێرد و شمشێر کتێبەکانی ئەوانی دڕاند. مەهدی هارون ڕەشیدی کوڕی ڕەوانە کرد. هارون لەباب تێپەڕی و گەیشتە جەیحان. حەسەن و سلێمان دوو کوڕەکەی بەرمەك و یەحیا کوڕی خالیدی بەرمەك، درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا. یەحیا سەرپەرەستی ئوردووگاکە، هەزینە و خەرجییەکان و شتەکانی دیکە بوو. ئەوان گەیشتنە قەلاّی سەمالوا و هارون بۆ ماوەی سی و هەشت ڕۆژ گەمارۆی خستەسەر و کەشکەنجیرەکانی بۆ دانان. فەرمانڕەوای ئەو قەلاّیە دەرگاکانی بۆ کردنەوە و داوای ئەمانیان کرد. هارون ئەمانی پێ بەخشین و دەستیان بەسەر چەندین

ناوچەی دیکەدا گرت.

کاتێك مەهدی لەجەنگ گەڕایەوە، هاوڕێ لەگەڵ یەزید کوڕی مەنسور و عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی و فەزڵ کوڕی ساڵح کوڕی عەلی و عەلی کوڕی سلێمان کوڕی عەلی بەرەو بیت المقدس بەرێکەوت و موسوڵمانان تەندروست گەڕانەوە. هەڵبەت ژمارەیەك لەوان لەکاتی شەڕەکاندا کوژران. مەهدی، ئیبراهیم کوڕی ساڵحی لەفەرمانڕەوایەتی فەلەستین دوورخستەوە و دواتر هەمان پێگەی پێ بەخشی.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەهدی سەرانسەری ڕۆژئاوا، ئازەربایەجان و ئەرمەنستانی بەهارونی کوڕی سپارد و سابت کوڕی موسای وەك سەرپەرەستی کۆکردنەوەی باج و یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەکی وەك سەرپەرەستی دیوان دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا زوفەر کوڕی عاسم لەفەرمانداری جەزیرە دوورخرایەوە و عەبدوالله کوڕی ساڵح جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا مەهدی موعاز کوڕی موسلیمی لەفەرمانداری خوراسان دوورخستەوە و موسەییب کوڕی زوهەیری زەببی لەجێگەی ئەو دانا. یەحیا حەرەشی لەفەرمانداری ئیسفەهان لابرد و حەکەم کوڕی سەعیدی لەجێگەی ئەودانا. سەعید کوڕی دەعلەجی لەتەبەرستان و ڕویان لابرد و هەردوو ناوچەکەی بەعومەر کوڕی عەلا سپارد، موهەلهیل کوڕی سەفوانی لەجەرجان لابرد و هوشام کوڕی سەعیدی وەك فەرمانداری ئەو ناوچەیە دیاری کرد.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی سلێمان، فەرمانداری مەککە، مەدینە، تاییف و یەمامە بوو، ئیسحاق کوڕی سەباح فەرمانداری کوفە، محەممەد کوڕی سلێمان فەرمانداری بەحرەین و ئەهواز و نەسر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس فەرمانداری بەسرە و محەممەد کوڕی فەزڵ فەرمانداری موسڵ بوو.

لەم ساڵەدا مەهدی سەرپەرەستی ڕێ ورەسمی حەجی گرتە ئەستۆ.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان ئومەوی فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس بۆ بەرێکەوتن بەرەو شام و بەگومانی خۆی لەناو بردنی خەلافەتی مناڵەکانی عەباس و تۆڵە سەندنەوە لەوان، هێزەکانی خۆی کۆکردەوە بەلاّم سلێمان کوڕی یەقزان و حسەین کوڕی یەحیا کوڕی سەعید کوڕی سەعد کوڕی عوسمانی ئەنساری لەسەرقوستە (ساراگوزا) لەمەبەستەکەی ئەو پەشیمان بوونەوە و بەناچاری عەبدولرەحمان دەستی لەمەبەستەکەی خۆی هەڵگرت.

لەم ساڵەدا موسا کوڕی عەلی کوڕی رەباحی لەخمی مرد.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی تەهمانی فرەزان و زانا مرد. ئەو خەڵکی نەیشابور و لەمەککە چاوی لەجیهان بەست.

لەم ساڵەدا باوکی ئەشهەب جەعفەر کوڕی حەییان لەبەسرە مرد.

لەم ساڵەدا بوکار کوڕی شورەیح، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە کۆچی دووایی کرد و سەرپەرەستی ئەو دامەزراوە بەباوکی مێکرەزی فێهری گەیشت. ناوی یەحیا کوڕی عەبدوالله کوڕی کورز بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست و چواری کۆچی (٧٨٠ زایینی)

لەم ساڵەدا عەبد کەبیر کوڕی عەبد حەمید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی زەید کوڕی خەتاب لەدەرب ئەلحەدەس سوپای رازاندەوە و میخائیلی بەتریق و تارازی بەتریقی ئەرمەنی لەگەڵ نەوەد هەزار شەڕکەر ڕووبەڕووی بوونەوە. عەبد کەبیر ترسا و هێزەکانی لەجەنگ دوورخستەوە و ئەوانی گەڕاندەوە. مەهدی مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام نێوبژیوانان نێوەنجیگەرییان کرد و مەهدی تەنیا بەزیندانی کردنی ئەوبەسەندەی کرد.

لەم ساڵەدا مەهدی، محەممەد کوڕی سلێمانی لەفەرمانداری بەسرە و ناوچەکانی دیکە لابرد و ساڵح کوڕی داوودی لەجێگەی ئەودانا.

هەروەها لەم ساڵەدا مەهدی بەمەبەستی حەج بەرەو مەککە بەڕێکەوت بەڵام کاتێك گەیشتە عوقەبە و کەمی ئاوی بینی، ترسا نەوەك ئاو بەشی هەموو خەڵکان نەکات. هەروەها گرفتاری (تا) بوو و بەمشێوەیە بێ ئەوەی حەج بکات گەڕایەوە. ساڵحی برای ڕەوانە کرد تا ڕێ ورەسمی حەج لەگەڵ خەڵکان ئەنجام بدات. خەڵك بەشێوەیەك گرفتاری تینویەتی بوون کەهەمووان مۆتەکەی مەرگیان لەبەردەم خۆیاندا دەبینی. مەهدی لەسەرپەرەستی ئاو (یەقتین) توڕە بوو.

لەم ساڵەدا مەهدی لەبەر توڕە بوونی لە عەبدوالله کوڕی سلێمان، ئەوی لەسەر کار لابرد و کاتی بەجێهێشتنی یەمەن کەسێکی نارد تا کەل و پەلەکانی بگەڕێت و سامانەکەی بخەملێنێت. ئەو مەنسور کوڕی یەزید کوڕی مەنسوری وەك فەرمانداری یەمەن و یەزید کوڕی حاتەمی وەك فەرمانداری ئەفریقییە ڕەوانە کرد. کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون کەناویان برا. محەممەد کوڕی فەزڵ فەرمانداری موسڵ بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی دوای ئەوەی سەعلەبە کوڕی عوبەیدی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ سەرقوستە( ساراگوزا) ڕەوانە کردبوو، خۆیشی بەرەو ئەو سەرزەمینە بەڕێکەوت. سلێمان کوڕی یەقزان و حسەین کوڕی یەحیا -- بەو شێوەی وتوویانە – نافەرمانی فەرمانی عەبدولرەحمانیان کرد و بۆ

لابردنی لەفەرمانڕەوایی پەیمانیان بەست. سەعلەبە بوێرانە رووبەروویان بوویەوە. لەیەکێك لەڕۆژەکان کەسەعلەبە بۆ خێوەتەکەی خۆی گەڕابوویەوە، سلێمان بێ ئاگایی ئەوی بەهەل زانی و هێرشی کردەسەر و توانی بلاوە بەسوپاکەی بکات. سلێمان داوای هاوکاری لەگارلە فەرمانڕەوای فەرەنگ کرد و مژدەی پێدا سەرزەمینەکەی خۆی لەگەڵ سەعلەبە بەو بسپێرێت. کاتێك گارلە هاتە لای سلێمان، بینی تەنیا توانیویەتی سەعلەبە گرفتار بکات. گارلە سەعلەبەی گرت و بۆ سەرزەمینەکەی خۆی گەڕایەوە. ئەو گومانی دەکرد دەتوانێت بۆ ئازاد کردنی سەعلەبە بەهایەکی زۆر وەربگرێت بەلام عەبدولرەحمان گرنگی بەئازاد کردنی ئەو نەدا. دواتر کەسی بەدوای ئەودا نارد و فەرەنگییەکان ئەویان رزگار کرد.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان رووی کردە سەروقوستە ( ساراگوزا) و منالەکانی خۆی بەهەموو ناوچەکاندا بلاو کردەوە تا هەموو دژایەتی و نافەرمانییەکان سەرکوت بکەن. بڕیاریاندا لەسەرقوستە کۆببنەوە. عەبدولرەحمان پێش ئەوان کەوت. حسەین کوڕی یەحیا سلێمان کوڕی یەقزانی کوشت و خۆی فەرمانڕەوایەتی ساراگوزای دەکرد، دواتر عەبدولرەحمان هات و بارودۆخی لەکەسەکانی حسەین دژوار کرد. منالەکانی عەبدولرەحمان لەگەڵ ئەسیرە نارازییەکان لەهەموو ناوچەکانەوە هاتن. نەیارەکان حسەینیان ئاگادار کردەوە کەدەخوازن شوێنکەوتەی فەرمانەکانی عەبدولرەحمان بن و بەمشێوەیە حسەین بەناچاری رێگەی سازانی گرتەبەر و عەبدولرەحمان رازی بوو. عەبدولرەحمان سەعیدی کوڕی حسەینی وەك بارمتە لای خۆی راگرت و لەوێوە بەمەبەستی جەنگ لەگەڵ فەرەنگەکان هێزەکانی خۆی کۆکردەوە. عەبدولرەحمان بەشێوەیەکی بێ بەزەییانە هێرشی کردە سەر فەرەنگەکان و سامانی ئەوانی تالان کرد و ژمارەیەکی زۆری لێ ئەسیر کردن. پێشڕەوی کرد تا گەیشتە قولهوڕە (کالاهورا) دەستی بەسەر شاری فوکەیرەدا گرت و قەلاکانی وێران کرد. دواتر بەرەو شاری بەشکەنس بەرێکەوت و لەقەلای ئەقرەع موسمین ئورودووی لێدا و دەستی بەسەر ئەو قەلایەشدا گرت. دواتر مەبەستی جەنگ لەگەڵ مولدوسون کوڕی ئەتلالی کرد و دەستی بەسەر قەلاکەی ئەویشدا گرت، خەلکان رێگەی کوێستانەکانیان گرتەبەر

بەڵام سوپاکەی عەبدولرەحمان ئەوانی لەناو برد. دەستیان بەسەر کوێستانەکانیشدا گرت و بۆ کوردوبا گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان بەربەرەکانی بەلەنسیە ( والنسیا) و بەربەرەکانی شەنت بەرییەی ئاندۆلۆس چەندین جەنگ روویدا و لەئەنجامدا ژمارەیەکی فراوان لەهەر دوولا کوژران. رووداوەکانی نێوان ئەوان بەناوبانگە.

لەم ساڵەدا شەیمان کوڕی عەبدولرەحمان باوکی معاویەی تەمیمی نەحوی بەسری و عەبدولعەزیز کوڕی عەبدوالله کوڕی باوکی سولەمەی ماجشون، عیسا کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس مامی مەنسور (کەوتراوە لەساڵی سەد و شەست و سێ لەتەمەنی حەفتا و هەشت ساڵی یا هەشتا ساڵی) سەعید کوڕی عەبد عەزیزی دیمەشقی، سەلام کوڕی مسکێنی نەمری ئەزدی، باوکی روەح و موبارەك کوڕی فوزالە کوڕی باوکی ئومەییەی قورەشی موالی عومەر کوڕی خەتاب، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست و پێنجی کۆچی ( ٧٨١ زایینی )

## جەنگی ڕۆم

لەم ساڵەدا مەهدی، هارون ڕەشیدی کوڕی لەجومادی الاخر/ ژانویە بۆ جەنگی هاوینە لەگەڵ ڕۆمییەکان ڕەوانە کرد. ژمارەی سوپاکەی ئەو نەوەد و پێنج هەزار سوارە و نۆسەد و نەوەد و سێ پیادە بوو. لەم جەنگەدا ڕەبیع هاوڕێیەتی دەکرد. هاورن ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ڕۆمییەکان و نەقیز، قومسی قومسەکان ( ئەمیری ئەمیرەکان) لەبەرابەر ئەو سوپای ڕازاندەوە. یەزید کوڕی مەزیدی شەیبانی جەنگی دەستەویەخەی لەگەڵ کرد و کوشتی و بەمشێوەیە یەزید سوپاکەی قومسی شکستدا. دواتر بەرەو دوموستوق ملی ڕێگەیان گرتەبەر. جبەخانەکان لەوێ بوو. ئەو سەد و نەوەد و سێ هەزار و چوارسەد و پەنجا دینار وبیست و یەك هەزار هەزار و چواردە هەزار و هەشتسەد درەمی پێشکەشی هارون ڕەشید کرد.

هارون پێشڕەوی کرد تا گەیشتە کەنداوی کۆنستانتین ئۆپێل. لەو ڕۆژگارەدا شاژنی ڕۆم، عەتسە[٣] ژنی ئەلیون بوو چوونکە کوڕەکەی بچوك و کاتێك باوکی مردبوو، ئەم مناڵە هێشتا لەباوەشی دایکیدا بوو. لەنێوان ئەم ژنە و هارون ئاشتی سەقامگیر کرا و عەتسە بەدانی تاوان ڕازی بوو. بەشێوەیەك ڕازی بوو بازارەکان بۆ هارون ڕەشید بکاتەوە و ڕێنیشاندەرانی بخاتە بەردەست. پێویستی ڕێنیشاندەران لەبەر ئەوە بوو چوونکە هارون دەبوا لەڕێگەیەکی مەترسیدار گوزەر بکات و عەتسە بەم پێشنیارە ڕازی بوو. بڕی تاوانەکە ساڵانە حەفتا هەزار دینار بوو. بەمشێوەیە هارون ڕەشید ئەو سەرزەمینەی بەجێهێشت.

ئاشتی بۆ ماوەی سێ ساڵ درێژەی کێشا و ئەوەی موسوڵمانان لەم ماوەدا دەستیان کەوت، پێنج هەزار و شەشسەد و چل و سێ ئەسیر و بیست هەزار چوارپێ و لەگەڵ کەرەستەکانی سەربڕینی مانگا بوو. لەم ڕووداوەدا پەنجا و چوار هەزار ڕۆمی کوژران و دوو هەزار و نەوەد ئەسیر لەخوێنی خۆیاندا گەوزان.

---

[٣] لەمێژوی تەبەری بە (ئەغستە) و لەمێژوی مختصر الدول کوری عبری (ل. ١٢٦ بەم شێوەیە باسی کراوە: ئیرینی ژنی پاشا ئون

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا خەلەف کوڕی عەبدوالله لەفەرمانداری ڕەی دوورخرایەوە و عیسا موالی جەعفەر جێگەی ئەوی گرتەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی مەنسور ڕێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزارەکان هەمان کەسانی ساڵی پێش بوون جگە لەوەی فەرماندەی پاسەوانەکان و پێشنوێژی بەسرە، ڕوەح کوڕی حاتەم و فەرمانداری ئاوەدانییەکانی دیجلە و بەحرەین و عەممان و کەسکەر و ئەهواز و فارس و کرمان، موعەلا موالی مەهدی و فەرمانڕەوای موسڵ ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا حسەین کوڕی یەحیا لەسەرقوستە ( ساراگوزا) ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و پەیمانەکەی لەگەڵ عەبدولرەحمان شکاند. عەبدولرەحمان غالب کوڕی سومامە کوڕی عەلقەمەی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و دوای شەڕ و جەنگی زۆر، دەستەیەك لەهاوەڵانی حسەین هاوڕێ لەگەڵ یەحیای کوڕی گرفتاری سومامە بوون. سومامە ئەوانی بۆ لای عەبدولرەحمان نارد و عەبدولرەحمان هەموویانی کوشت. سومامە گەمارۆی خستبووە سەر حسەین تا ئەوەی لەساڵی ٧٧٨/١٦٢ زایینی عەبدولرەحمان خۆی بەرەو ساراگوزا بەڕێکەوت و بارودۆخی لەحسەین دژوار کرد و سی و شەش کەشکەنجیری بۆ لەناو بردنی ئەو دانا و بەزۆر دەستی بەسەر سەرزەمینەکەی ئەودا گرت و بەقێزەونترین شێوە حسەینی کوشت و خەڵکانی ساراگوزای دوورخستەوە چوونکە پەیمانەکەی خۆیان لەگەڵ عەبدولرەحمان شکاندبوو.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی مەنسور کوڕی عەبدوالله کوڕی یەزید کوڕی شەهر کوڕی مەسوەب مرد. ئەو لەمناڵەکانی شەهر زوئەلجەناح حومەیری، خاڵی مەنسور بوو. ئەو فەرمانداری یەمەن و سەرپەرەستی حاجییەکان بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا فەتح کوڕی وەشاحی موسڵی خواپەرەست کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد وشەست و شەشی کۆچی ( ٧٨٢ زایینی )

لەم ساڵەدا مەهدی بۆ هارون ڕەشیدی کوڕی دوای موسای هادی بەیعەتی لەخەڵکان وەرگرت و نازناوی ڕەشیدی پێبەخشی. لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی حەسەنی عەنبەری لەسەرپەرەستی کردنی دامەزراوەی دادی بەسرە دووخرایەوە و خالید کوڕی تولەیق کوڕی عیمران کوڕی حوسەین جێگەی ئەوی گرتەوە بەلاّم خەڵکان بەو رازی نەبوون.

## چۆنیەتی لەناو بردنی یەعقوب کوڕی داوود

لەم ساڵەدا مەهدی لەوەزیرەکەی خۆی یەعقوب کوڕی داوود کوڕی تەهمان توڕە بوو. سەرەتای کارەکە بەمشێوە بوو کەداوود کوڕی تەهمان یا هەمان باوکی یەعقوب و براکانی دەبیرەکانی نەسر کوڕی سەیار بوون. کاتێك ڕۆژگاری یەحیا کوڕی زەید دەستی پێکرد، داوود ئەوەی لەنەسری دەبیست، ئەوی لیّ ئاگادار دەکردەوە. کاتێك ئەبو موسلیمی خوراسانی مەبەستی تۆڵە کردنەوەی خوێنی یەحیا کوڕی زەیدی کرد، داوود ڕۆشتە لای و ئەوی لەزانیارییەکانی خۆی سەبارەت بە کاری ئەو دوو کەسە ئاگادار کردەوە. ئەبوموسلیم ئەمانی پێبەخشی بەلاّم سامانەکەی لیّ سەند کە لەرۆژگاری نەسر کۆی کردبوویەوە.

کاتێك داوود مرد، مناڵەکانی بەزانست گەورە بوون بەلاّم لەدامەزراوە و دەوڵەتی مناڵەکانی عەباس هیچ پێگەیەکیان دەست نەکەوت. لەبەر ئەوەی نەسری باوکیان پیشەی دەبیری هەبوو، چاوی تەماحیان نەدەبڕییە دەوڵەتی مناڵەکانی عەباس. ئەوان شوێن باوەڕی زەیدییە کەوتن و بوونە شوێنکەوتەی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و هیوادار بوون دەوڵەتێك پێکبهێنن. داوود لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن هاوڕا بوو و لەگەڵ دەستەیەك لەبراکانی لەگەڵ ئەو ئالاّی شۆڕشیان بەرز کردەوە. کاتێك ئیبراهیم کوژرا، مەنسور بەدوای ئەواندا گەڕا و یەعقوب و عەلی گرت و زیندانی کردن. کاتێك مەنسور مرد، مەهدی

ئەو دوو کەسەی لەگەڵ زیندانییەکانی دیکە ئازاد کرد. حەسەن کوڕی ئیبراهیم لەگەڵ ئەو دووانەدا زیندانی بوو کە بەنێوەنجیگەری رەبیع - بەوشێوەی ئاماژەی پێدرا- لەمەهدی نزیک بوویەوە. هەروەها وتوویانە بەسەرکۆنە کردن و خراپە وتنی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب خۆی لەمەهدی نزیک کردەوە و پێگەی بەرز بوویەوە تا ئەوەی وەزارەتی پێبرا.

مەهدی دەڵێت: چەندایەتی و چۆنایەتی یەعقوب لەخەودا بۆ من دەرکەوت، لەخەودا فەرمانیان بەمندا کە: ئەو وەك وەزیر دیاری بکە، کاتێك لەبێداریدا ئەوم بینی، بەهەمان شێوە بینیم کەلەخەودا بینیبووم. بەمشێوەیە وەزارەتم پێبەخشی. کاتێك وەزارەتی گرتەدەست، شوێنکەوتەکانی زەیدییە کۆکردەوە و کاروباری خەلافەتی لەرۆژهەلاّت و رۆژئاوا بەوان سپارد. لەبەر ئەمەیە بەشار کوڕی بورد هۆنراوەیەکی بەمشێوە هۆنییەوە:

بنی امیة هبوا طال نومكم  ان الخليفة يعقوب بن داود

ضاعت خلافتكم يا قوم فالتمسوا  خليفة الله بين الناى و العود

واتاکەی: ئەی منداڵەکانی ئومەییە! لەخەو هەستن چوونکە خەوتان درێژەی کێشاوە و ئەوە یەعقوب کوڕی داوودە خەلافەت دەکات. ئەی خەڵکینە! خەلافەتی ئێوە لەناو چووە و دەبێت خەلافەتی خوایی یا لەژەنینی نەی بۆی بگەڕێن یا لەژەنینی عود.

موالیەکانی مەهدی رژدییان پێبرد و خراپەی ئەویان هێنایە سەرزمان. بەمەهدی دەوترا: رۆژهەلاّت و رۆژئاوا لەدەستی یەعقوب و هاوەلاّنی ئەودایە، ئەوەندە بەسە نامەیان بۆ بنووسێت تا لەیەك رۆژ ئالاّی شۆڕش بەرز بکەنەوە و ئەو جیهان بۆ ئیسحاق کوڕی فەزل دەگرێت ( فەرمانڕەوایی بەئیسحاق کوڕی فەزڵ دەسپێرێت)

ئەم وتانە دڵی مەهدی ڕەش کرد و کاتێك عیسا ئابادی دروست کرد یەکێك لەخزمەتگوزاران پێی وت: ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی پێی وتم: مەهدی شوێنێکی رابواردنی بەپەنجا هەزار درهەم لەگەنجخانە دروست کردووە. مەهدی ئەم قسەی بیست بەلاّم بیری چوو کەبێژەرەکەی ئەحمەد کوڕی عیسایە.

لای خۆی گومانی دەکرد یەعقوب ئەم قسەی هێناوەتە سەرزمان تا ئەوەی ڕۆژێك یەخەی یەعقوبی گرت و وتی: ئایا مەگەر بەو شێوەیە قسەت نەکردووە؟ یەعقوب وەڵامی دایەوە: سوێند بەخوا نەبیستوومە، نەهێناومەتە سەرزمان. کەسان بەنهێنی خراپەی یەعقوبیان دەهێنایە سەرزمان و کاتێك لەیەك جیادەبوونەوە، گومانیان دەکرد مەهدی بەیانی دەیگرێت بەڵام بۆ بەیانی مەهدی دەم بەبزە سەیری دەکرد و لەچۆنیەتی خەوەکەی دەپرسی.

مەهدی ئارەزوومەندی ژنان بوو و یەعقوب سەبارەت بەژنەکان قسەی خۆشی لەگەڵ دەکرد و بەمشێوەیە لەیەك جیا دەبوونەوە. یەعقوب مایینێکی هەبوو. ڕۆژێك لای مەهدی ڕۆشت، جل و بەرگێکی لەبەردا بوو لەبەر ناسکی بەجەستەیەوە نەدەوەستا. جڵەوی مایینەکە بەدەست کۆیلەیەکەوە بوو بەڵام کۆیلەکەی خەو زۆری بۆ هێنا بوو. یەعقوب سوار مایینەکە بوو و کاتێك ویستی جلەکانی کۆبکاتەوە، مایینەکە لەم جووڵە ڕەمی کرد و یەعقوب کەوتە خوار. دووبارە هەستایەوە و لەمایینەکە نزیك کەوتەوە و مەبەستی ئەوەی کرد سوار ببێتەوە کە لەناکاو مایینەکە لەقەیەکی لێدا و قاچی شکاند و چیتر نەیتوانی سوار هیچ چوارپێیەك ببێت. بەیانی ئەو ڕۆژە مەهدی سەردانی کرد و ئیتر بۆ ماوەیەك نەیبینی. بەمشێوەیە ئەوەندە خراپەی ئەویان هێنایە سەرزمان کەمەهدی چیتر نەیتوانی تووڕەی خۆی بشارێتەوە و فەرمانیدا لەزیندانی نەسر زیندانی بکەن. هەروەها فەرمانی گرتنی کارگوزار و هاوەڵانی ئەویشی دەرکرد.یەعقوب کوڕی داوود دەڵێت: ڕۆژێك مەهدی کەسی بەدوای مندا نارد و کاتێك ڕۆشتمە لای، لەنشینگەیەکدا بینیم کەبە فەرشە گوڵدارەکان لەباخێکی پڕدار کەلقەکانی سێبەریان بۆ دروست کردبوو و تەنیا شکۆفەی قۆخ و سێوی تیا دەبینرا، ڕازابوویەوە. کەنیزێك لەسەر فەرشەکە لای مەهدی دانیشتبوو. جوانتر لەو کەنیزەم نەبینیبوو. مەهدی پێی وتم: یەعقوب! نشینگەکەی منت چۆن بینی؟ وەڵامم دایەوە: لەو پەڕی جوانیدا، هیوادرام خواوەند شتی زیاتر بەسەروەری باوەڕداران ببەخشێت.

مەهدی وتی: ئەم شوێنە و هەموو شتەکانی بۆ تۆ. ئەم کەنیزەیش پێشکەشە

بەتۆ. یەعقوب دەڵێت: سپاسم کرد. دواتر پێی وتم: یەعقوب! نیازێکم بەتۆ هەیە و دەمەوێت بۆ بەدیهێنانی پەیمانم پێ بدەیت. وتم: فەرمان، فەرمانی فەرمانڕەوایە، بەسەر چاوان. منی بەخوا و سەری خۆی سوێندداا. منیش سوێندم خوارد بێ هیچ گومانێك فەرمانەکەی جێبەجێ بکەم. وتی: ئەو پیاوە، فلأنەی فیسارە کەس ( حەسەن کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی) لەمناڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، دەمەوێت لەناوی ببەیت و من لەڕەنجی ئەو ئاسوودە و بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پەلە بکەیت. وتم: ئەو کارە دەکەم. باخ و بێستان و کەنیزەکەم هەڵگرت. مەهدی فەرمانیدا سەد هەزار درهەمم پێ ببەخشن. لەبەر خۆشەویستی زۆرم بۆ ئەو کەنیزە لەشوێنێك دامنیشاند کەتەنیا پۆششێکی ناسك لەنێوانماندا بوو. پیاوی عەلەویم هێنایە لای خۆم و پرسیارم لێکرد. ئەوەی دەمویست، منی لێ ئاگادار کردەوە. ئەوم بەپیاوێکی بیرمەند بینی کەباشتر لەهەر کەسێك دەتوانێت نهێنییەکانی دڵی خۆی بدرکێنێت. وتی: ئەی یەعقوب! هاوار لەتۆ، دەتەوێت کاتێك بۆ سەردانی پەروەردگار بڕۆیت کەخوێنی من هاوشێوەی مناڵێك لەمناڵەکانی فاتیمە لەملی تۆدا بێت؟ وتم: نا سوێند بەخوا، ئایا دەتوانی بەکارێکی چاکە هاوکاریم بکەیت؟ وتی: ئەگەر خۆت چاکە بکەیت، سپاست دەکەم و دۆعات بۆ دەکەم و داوا دەکەم خواوەند لێت رازید بێت. پێم وت: کام رێگەیە پەسەند دەکەیت؟ ئەویش باشترین رێگەی پێشنیار کرد. کەسم بەدوای ئەو کەسەدا نارد کە ئەو پیاوە عەلەوییە بەبڕواپێکراوی دەزانی. پارەم بەو پیاوەدا بیبات. کەنیزەکە ئەم هەواڵەی بەمەهدی گەیاند و ئاگاداری کردەوە. ( وادیارە مەهدی کەنیزەکەی بۆ سیخوڕی بەیەعقوب بەخشیوە) مەهدی چەندین کەسی بۆ سەر رێگەی ئەو پیاوە عەلەوەییە نارد و خۆی و هاوەڵانیان بردە لای مەهدی.

بۆ بەیانی ئەو رۆژە، مەهدی منی بانگ کرد و پرسیاری ئەو پیاوە عەلەوییەی کرد. پێم وت خوێنم ڕشتووە. مەهدی منی بەخوا و سەری خۆی سوێندداا و منیش سوێندم خوارد. فەرمانی بەکۆیلەکەی خۆیدا ئەو پیاوە و پارەکە لەگەڵ ئەودا بێنێت. سەرمسوڕما و توانای قسە کردنم نەما و نەمدەزانی دەبێت چی بکەم. مەهدی وتی: ڕشتنی خوێنی تۆ بۆ من ڕەوایە بەلأم لەزیندانی مەتبەق زیندانی

بکەن و کەس لای من ناوی ئەو نەهێنێت.

منیان لەزیندانی مەتبەق زیندانی کرد و چاڵێکیان بۆ هەڵکەندم. چەند ساڵێك لەو چاڵەدا مامەوە کە بەتەواوی نازانم چەند ساڵە و سۆمای چاوم لەدەستدا. یەعقوب وتی: لەبەر ئەمە کاتێك منیان بانگ کرد تا سلاو بۆ سەروەری باوەڕداران بنێرم، ئەمیر بەمنی وت: من کام خەلیفەم؟ وەڵامم دایەوە: مەهدی. وتی: خواوەند بیبەخشێت. وتم: هادی. وتی: خواوەند بیبەخشێت. وتم: ڕەشید. وتی: بەڵێ، ڕەشیدم نیازی خۆت بڵێ. وتم: مانەوە لەمەککە، چوونکە چیتر نە بەهرەم بۆ ماوەتەوە نەئارەزوو. ئەویش مۆڵەتی مانەوەی پێدام و بەرەو مەککە بەرێکەوتم. یەعقوب تەنیا چەند ڕۆژێك لەمەککە مایەوە و دواتر مرد.

یەعقوب پێش ئەوەی زیندانی بکرێت، لەپێگەکەی بێزار ببوو. چوونکە کەسانی نزیکی مەهدی لای یەعقوب عارەقیان دەخوارد و یەعقوب، ڕێگەی خواردنەوەی لەمەهدی دەگرت، ئامۆژگاری دەکرد و دەیوت: تۆ بۆ ئەم کارە منت نەکردۆتە وەزیر و منیش بۆ ئەو مەبەستە نەبوومە هاوڕێی تۆ، ئایا دوای خوێندنی پێنج فەرزەی نوێژ، لەنزیك تۆ دەبێت عارەق بخورێتەوە؟ ئەوەندە لای مەهدی پێداگری کرد کەوتیان:

فدع عنك يعقوب بن داود جانبا و اقبل على صهباء طيبة النشر

واتاکەی: ئەی مەهدی، یەعقوب کوڕی داوود لەسەر کار لاببە و ڕوو لەمەی و مەی خواردنەوە بکە.

ڕۆژێك یەعقوب لەبەرابەر یەکێك لەداواکارییەکانی مەهدی پێی وت: ئەم کارە زێدەڕۆییە. مەهدی لەوەڵامدا وتی: هاوار لە تۆ ئەی یەعقوب، زێدەڕۆیی لەگەورەکان جوانە، ئەگەر زێدەڕۆیی نەدەبوو، بەتوانا لە کەم توانا جیا نەدەکرایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەهدی بەرەو گورگان بەڕێکەوت و باوکی یوسف یەعقوب کوڕی ئیبراهیمی وەك سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەو شارە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا مەهدی فەرمانیدا بەیەك ئێستر و یەك وشتر لەنێوان مەککە و مەدینە نامەکان ئاڵوگۆڕ بکەن. پێشتر ئەم کارە گشتی نەبوو.

لەم ساڵەدا خوراسان دژی موسەییب کوڕی زوهەیر شۆڕشی کرد و مەهدی، فەزل کوڕی سلێمانی توسی باوکی عەباسی وەك فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە دیاریکرد و سەجستانی پەیوەستی خوراسان کرد. فەرمانی پێدا تا تەمیم کوڕی سەعید کوڕی دەعلەج وەك فەرمانداری ئەو ناوچەیە دەستنیشان بکات.

لەم ساڵەدا مەهدی، داود کوڕی ڕوەح کوڕی حاتەم و ئیسماعیل کوڕی موجالید و محەممەد کوڕی باوکی ئەیوبی مەککی و محەممەد کوڕی تەیفوری بەگوناحی زەندیقی زیندانی کرد و ئەوانی لەم ڕێگەیەوە گەڕاندەوە. ئەو داوودی بۆ لای باوکی لەبەسرە نارد و فەرمانی پێدا کوڕەکەی تەمیٚ بکات.

هەروەها لەم ساڵەدا مەهدی، ئیبراهیم کوڕی یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلەی وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان و عوبەیدالله کوڕی قوسەم فەرمانڕەوایی مەککە و تاییفی دەکرد.

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی یەزید کوڕی مەنسور لەفەرمانداری یەمەن دوورخرایەوە و عەبدوالله کوڕی سلێمانی ڕێبعی لەجێگەی ئەو دانیشت.

لەم ساڵەدا مەهدی، عەبدسەمەد کوڕی عەلی لەزیندان ڕزگار کرد. ئیبراهیم کوڕی یەحیا لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد. فەرمانداری کوفە، هاشم کوڕی سەعید و فەرمانداری بەسرە، ڕوەح کوڕی حاتەم و سەرپەرەستی دامەزراوەی ئەو شارە خالید کوڕی تولەیق و فەرمانداری دیجلە و کەسکەر و دەوروبەری بەسرە و بەحرەین و ئەهواز و فارس و کرمان، مەعلا موالی مەهدی و فەرمانداری میسر، ئیبراهیم کوڕی ساڵح و فەرمانداری ئەفریقییە یەزید کوڕی حاتەم و فەرمانداری تەبەرستان و ڕویان و گورگان، یەحیای حەرەشی و فەرمانداری دۆنباوەند و قومس، فەراشە موالی مەهدی و فەرمانداری ڕەی، سەعد موالی مەهدی و

فەرمانداری موسڵ، ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی هاشمی و یا بەگومانێك موسا کوڕی کەعبی خەسعەمی و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەو شارە عەلی کوڕی موسهەر کوڕی عومەیر بوو. لەم ساڵەدا جەنگی هاوینە رووینەدا چوونکە بەدوای بەستنی پەیمانی ئاشتی، ئاسوودەی سەقامگیر بوو.

لەم ساڵەدا بەشار کوڕی بورد، وتاردەری کوێر بەگومانی زەندیقی کوژرا. ئەو لەسکوماوە کوێر بوو.

لەم ساڵەدا جەڕاح کوڕی مولەیح روئاسی کەباوکی وەکیع بوو، مرد. هەروەها موبارەك کوڕی فوزالە و حەماد کوڕی سەلەمەی بەسریش مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس برازاکەی خۆی موغەیرە کوڕی وەلید کوڕی معاویە کوڕی هوشام و هوزەیل کوڕی سومەیل و سومرە کوڕی جەبەلەی کوشت چوونکە ئەوان لەگەڵ عەلا کوڕی حومەید پەیمانیان بەستبوو تا عەبدولرەحمان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی بێننە خوار. بەڵام عەلا نهێنی ئەوانی ئاشکرا کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست و حەوتی کۆچی( ٧٨٣ زایینی )

لەم ساڵەدا موسای هادی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان و کەرەستەیەکی بێ ئەندازە بۆ شەڕ لەگەڵ وەنداد هورموز و شەروین فەرمانداری تەبەرستان بەرەو جورجان بەرێکەوت. مەهدی موسا، ئەبان کوڕی سەدەقەی وەك دەبیر و محەممەد کوڕی جومەیلی وەك فەرماندەی سوپا و نوفەیع موالی مەنسوری وەك پاسەوانی سەراکەی و عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهانی وەك سەرکردەی پاسەوانەکان دەستنیشان کرد. هادی سوپایەکی بۆ جەنگ لەگەڵ هورموز وشەروین ڕەوانە کرد و یەزید کوڕی مەزیدی کردە فەرماندەی ئەم سوپایە. یەزید توانی گەمارۆ بخاتە سەر ئەو دوو کەسە.

لەم ساڵەدا عیسا کوڕی موسا لەکوفە مرد. ڕوەح کوڕی حاتەمی دادیار و دەستەیەك لەپیاو ماقوڵانی بۆ مردنی ئەو کردە شایەت. ساڵەکانی ژیانی ئەو شەست و پێنج ساڵ درێژەی کێشا. بیست و سێ سال جێگری خەلیفە بوو. پێشتر باسی جێگری و لابردنی ئەومان کرد.

لەم ساڵەدا مەهدی بۆ دۆزینەوە و شوێنکەوتنی زەندیقییەکان هەوڵیدا و توانی یەزید کوڕی فەیز بگرێت. ئەو دانی بەزەندیق بوونی خۆی نا و دواتر لەزیندان هەڵات و چیتر نەیانتوانی بیگرن. ئەو کەسەی شوێن زەندیقییەکان دەکەوت، عومەر کەلوزانی بوو.

لەم ساڵەدا مەهدی، باوکی عوبەیدالله معاویە کوڕی عوبەیداللەی لەسەرپەرەستی کردنی دیوان دوور خستەوە و ڕەبیعی بۆ ئەو کارە راسپارد.

لەم ساڵەدا نەخۆشییەکەی گشتگیر بەغداد و بەسرەی گرتەوە و خەڵکان هەموو گرفتاری کۆکە ڕەشە بوون.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەبان کوڕی سەدەقە، دەبیری هادی مرد ومەهدی فەرمانیدا باوکی خالید (چاوخێل) جێگەی ئەو بگرێتەوە.

لەم ساڵەدا مەهدی فەرمانیدا پانتایی کەعبە و مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ) فراوان بکەن و چەندین ژووری دیکەیان تیا دروست کرد. سەرپەرەستی ئەم کارە یەقتین کوڕی موسا بوو کەتا کاتی مەرگی موسا لەو پۆستەدا مایەوە.

مەهدی فەرمانیدا مزگەوتی هەینی شاری موسڵ فراوان بکەن و من (نوسەر)

نوسراوەکانی سەر دیواری ئەم مزگەوتەم بینیوە کەئاماژەیە بۆ ساڵەکانی شەشسەد و سێ و هێشتا مزگەوتەکە وەك خۆی ماوەتەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا یەحیا حەرەشی لەتەبەرستان و رویان و ناوچەکانی پەیوەست بەو سەرزەمینانە لەسەر کار لابرا و عومەر کوڕی عەلا جێگەی ئەوی گرتەوە. فەراشە، موالی مەهدی وەك فەرمانداری جورجان دیاریکرا.

لەم ساڵەدا لەسێی زیحەججە/٢٧ ژوئەن جیهان تاریك وتاریکی تا نیمەڕۆ بەردەوام بوو[٤]. لەم ساڵەدا جەنگی هاوینە رووینەدا چوونکە ئاشتی سەقامگیر کرابوو. ئیبراهیم کوڕی یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، فەرمانداری مەدینە رێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و چەند رۆژ دوای حەج کردن، کۆچی دووای کرد و ئیسحاق کوڕی عیسا کوڕی عەلی جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا عوقبە کوڕی سەلەمی هەنائی لەلایەن پیاوێکەوە لەناکاو هێرشی کرایەسەر و لەبەغداد مرد.

فەرمانداری یەمەن، سلێمان کوڕی یەزیدی حارسی و فەرمانداری یەمامە، عەبدوالله کوڕی موسعەبی زوبەیری و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی ئەو شارە، عومەر کوڕی عوسمانی تەمیمی بوو. فەرمانداری موسڵ، ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی هاشمی یا بەوتەیەك موسا کوڕی کەعب بوو. فەرمانڕەوای شارەکانی دیکە هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون.

لەم ساڵەدا جەعفەر، ئەحمەر باوکی شەیبە و حەسەن کوڕی ساڵح کوڕی حوبی کەدوانزە ئیمامی بوو لەگەڵ سەعید کوڕی عەبدوالله کوڕی عامری تنوخی، حیماد کوڕی سەلەمە و عەبدعەزیز کوڕی موسلیم، کۆچی دووایان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەرەبەکانی بیابانەکای بەسرە، لەنێوان یەمامە و بەحرەین، خراپەکارییان دەست پێکرد، رێگەکانیان گرت و سنوورەکانیان بەزاند و نوێژیان پشتگوێ خست (لەدین هەڵگەڕانەوە) مەهدی سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان رەوانە کرد. ئەم سوپایە شەڕیان کرد بەڵام عەرەبەکانی بیابان بەخۆڕاگری سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و زۆرینەی سوپاکەی مەهدییان لەناو برد و بەمشێوەیە شکۆ و گەورەیی ئەوان زیادی کرد و لەسەر خراپەکارییەکانی خۆیان بەردەوام بوون.

---

[٤] وادیارە ئەم خۆرگیرانە چەندین کاژێری خایاندووە و ئەم دیاردەیە لەجیهاندا کەم وێنەیە. (وەرگێڕ)

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست وهەشتی کۆچی ( ٧٨٤ زایینی )

لەرەمەزان/مارسی ئەم ساڵە، ڕۆمییەکان پەیمانی ئاشتی نێوان خۆیان و موسوڵمانانیان شکاند. ئەم پێشهاتە لەسەرەتاوە تا شکاندنی پەیمانەکە سی و دوو مانگ درێژەی کێشا. عەلی کوڕی سلێمان کەفەرمانداری جەزیرە و قێنسرین بوو، یەزید کوڕی بەتاڵی لەگەڵ سوپایەك بۆ شەڕی ڕۆمییەکان ڕەوانە کرد. سوپای موسوڵمانان تالآنی زۆریان دەستکەوت و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

## شۆڕشی خەوارایج لەموسڵ

لەم ساڵەدا لەسەرزەمینی موسڵ، یەکێك لەخەواریج بەناوی یاسین لەهۆزی مناڵەکانی تەمیم ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. سوپایەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بەرەو موسڵ بەرێکەوت بەلآم توانی شکستیان پێ بێنێت و دەسەلآتی خۆی بەسەر زۆرینەی سەرزەمینەکانی ڕەبیعە و جەزیرەدا بسەپێنێت. ئەو شوێنکەوتەی ساڵح کوڕی موسەرەحی خوارجی بوو.

مەهدی، باوکی هورەیرە محەممەد کوڕی فروخیی قائید و هەرسیمە کوڕی ئەعیەم موالی مناڵەکانی زەببەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. ئەم دوو کەسە چەندین جەنگیان لەگەڵ یاسین خستەگەڕ. یاسین خۆڕاگری کرد تا ئەو کاتەی ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکانی کوژران و شوێنکەوتەکانی دیکەی شکستیان خوارد.

## ناسازگاری باوکی ئەسوەد لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا باوکی ئەسوەد، محەممەد کوڕی یوسف کوڕی عەبدولرەحمانی فێهری لەئاندۆلۆس ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. بەسەرهاتەکەی بەمشێوەیە: دوای هەلآتنی باوکی لەزیندانی عەبدولرەحمان لەکوردوبا و کوژرانی براکەی

عەبدولرەحمان، باوکی ئەسوەد زیندانی کرا. ئەو لەزیندان لاسایی کوێرەکانی دەکردەوە و چاوی خۆی بۆ هیچ شتێك نەدەکردەوە. ماوەیەکی زۆر بەمشێوە بوو تا ئەوەی عەبدولرەحمانی ئومەوی باوەڕی بەکوێری ئەو هێنا.

لەقولایی زیندانەکە ساردخانەیەك دروست کرابوو کە بەرووبارێکی گەورە دەگەیشت. زیندانییان لەوێ دەهاتنەدەر تا نیازەکانی خۆیان (خۆ شۆردن و کارەکانی دیکە) دابین بکەن. پاسەوانەکان گرنگییان بەباوکی ئەسوەد نەدەدا چوونکە گومانیان دەکرد کوێرە. ئەو هەر کاتێك لای ئەم رووبارە بۆ زیندان دەگەڕایەوە، دەیوت: چ کەسێك ئەم کوێرە بۆ شوێنەکەی خۆی رێنوێنی دەکات؟

باوکی ئەسوەد کۆیلەیەکی بوو کەلای رووبارەکە قسەی لەگەڵ دەکرد. رێگەی ئەم کارەیان لێ نەدەگرت. لەگەڵ ئەم کۆیلەیە کاتێکیان دیاری کرد تا ئەسپێکی بۆ بێنێت و لەکاتێکدا کۆیلەکە چاوەڕوانی هاتنی ئەوی دەکرد، بەمەلە کردن لەروبار پەڕییەوە و خۆی گەیاندە تۆلدۆ. خەڵکانێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. باوکی ئەسوەد بۆ جەنگ لەگەڵ عەبدولرەحمان گەڕایەوە. دوو سوپا لەوادی ئەحمەر قەستەلونە ( کاستلۆن) رووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕێکی دژواریان دەستپێکرد. باوکی ئەسوەد شکستی خوارد و چوار هەزار کەس لەهاوەڵانی ئەو کەکەوتنە ناو رووبارەکە، کوژران. عەبدولرەحمانی ئومەوی شوێنپێی هەڵگرت و بەهەر کەسێك دەگەیشت، خوێنی دەڕشت تا ئەوەی باوکی ئەسوەد خۆی بەقەڵای رەباح گەیاند. دووبارە هێز و سوپای کۆکردەوە و لەسالی ١٦٩/٧٨٥ زایینی مەبەستی جەنگ لەگەڵ عەبدولرەحمانی ئومەوی کرد. کاتێك رووبەرووی پێشەنگەکانی سوپاکەی عەبدولرەحمان بوویەوە، هەڵات. لەم ناوەدا خێزانەکەی گرفتار بوون و زۆربەی پیاوەکانیان لەناو خوێنی خۆیاندا گەوزان بەلام خۆی تا سالی ٧٦٨/١٧٠ زایینی زیندوو بوو و سەرئەنجام لەیەکێك لەگوندەکانی نزیك تۆلدۆ مرد.

دوای ئەو برایەکی بەناوی قاسم ئالای شۆرشی بەرز کردەوە و سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد. عەبدولرەحمان رووبەرووی بوویەوە. قاسم بێ وەرگرتنی ئەمان ڕۆشتە لای عەبدولرەحمان و ئەویش دەستبەجێ کوشتی.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا شیلون پاشای جەلیقییە (گالیسیا) مرد و ئەزفونشیان (ئالفۆنسۆ) لەجێگەی ئەو لەسەر تەخت دانیشاند. مورگات دژی ئەو ڕاپەڕی و کوشتی. بەمشێوەیە ڕشتەی کارەکانیان پچڕا. فەرمانداری عەبدولرەحمان لەتۆلدۆ سوپایەکی بۆ جەلیقییە نارد، کوشتاری کرد و تالآنی زۆری کۆکردەوە و کەسانی زۆری ئەسیر کرد و بێ ئەوەی زیانی پێ بگات، گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی قاسم کوڕی واسول فەرمانڕەوای خەواریجی سوفرییە لەسەجلماسە (مەراکیشی ئێستا) لەناکاو لەکاتی نوێژی ئێواریْ مرد. فەرمانڕەوایی ئەو دوانزە ساڵ و یەك مانگ درێژەی کێشا و دوای ئەو کوڕەکەی ئەلیاس جێگەی گرتەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا مەهدی سەعیدی حەرەشی لەگەڵ چل هەزار شەڕکەر بۆ تەبەرەستان ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا عومەری کەلوزانی، ئەو کەسەی بۆ لەناو بردنی زەندیقییەکان ڕاسپێردرابوو، مرد و محەممەد کوڕی عیسا کوڕی حەمدویە، جێگەی ئەوی گرتەوە. محەممەد خوێنی دەستەیەکی فراوان لەزندیقییەکانی ڕشت.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی مەهدی کە بە( کوڕی ریتە) ناویان دەبرد، ئایینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی سەلەمە کوڕی کوهەیل و عوبەیدالله کوڕی حەسەنی عەنبەری سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە و مەندەلی کوڕی عەلی و محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عولاسە کوڕی عەلقەمەی قازی و حەسەن کوڕی زەید کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، مردن. مەنسور، حەسەن کوڕی زەیدی بۆ ماوەی پێنج ساڵ کردە فەرمانداری مەدینە و دواتر ئەوی لەسەر کار لابرد و لەبەغداد زیندانی کرد و دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت. کاتێك مەهدی جێگەی باوکی گرتەوە، ئەوی لەزیندان ئازاد کرد و سامانەکەی بۆ گەڕاندەوە. ئەو بەخشەر بوو بەلآم لەبنەماڵەکەی دابڕا و پەیوەستی مەنسور بوو. لەم ساڵەدا بیشر کوڕی ڕەبیع و عەبەس کوڕی قاسم مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و شەست و نۆی کۆچی (٧٨٥ زایینی)

## بەسەرهاتی مەرگی مەهدی

لەم ساڵەدا مەهدی باوکی عەبدوالله محەممەد کوڕی عەبدوالله مەنسور لەماسەبزان کۆچی دوایی کرد. هۆکاری ڕۆشتنی مەهدی بۆ ئەو ناوچە بۆ لابردنی کوڕەکەی موسای هادی لەجێگری خەلیفە و گرتنی بەیعەت بۆ ڕەشید وەك خەلیفە و لەپێشی بەخشین بەو بوو. لەبەر ئەمە پەیکی بۆ لای هادی نارد کە لەجورجان بوو. ئەوی لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار کردەوە و بانگی کرد. بەڵام هادی پەیکی قامچی باران کرد و لەڕۆشتن خۆی بەدوور گرت. مەهدی بەرەو لای هادی بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ماسەبزان، خواردنێکی خوارد و خەوێکی قورس دایگرت. فەرمانیدا تاخۆی بەخەبەر نەهاتۆتەوە، کەس هەڵی نەستێنێت. ڕۆشتە سەرجێگەکەی و خەوت. هاوەڵانیشی خەوتن کە لەناکاو بەدەنگی هاوار لەسەر جێگەکەی مەهدی لەخەو ڕاچەنین و بەخێرایی خۆیان گەیاندە لای مەهدی. مەهدی وتی: پیاوێك لەبەر دەرگا وەستابوو و ئەم هۆنراوەی دەخوێندەوە:

| | |
|---|---|
| کانی بهذا القصر قد باد اهله | و اوحش منه ربعه و منازله |
| و صار عمید القوم من بعد بهجة | و ملك الی قبر علیه جنادله |
| فلم یبق الا ذکره و حدیثه | تنادی علیه معولات حلائله |

واتاکەی: دەڵێی کەسانی ئەم کۆشکە لەناچوون و شوێن شوێنی ئەم کۆشکە لەخۆی دەترسێت و پێشەوای خەڵکان دوای شادمانی و خۆشی ڕۆشتۆتە ناو گۆڕێك کەبەرد قورسایی لەسەر دەکات و تەنیا بیرەوەری و وتەکانی ئەو ماوەتەوە کەهاوسەرەکانی بەدەم هاوار کردنەوە، دەیلێنەوە.

دە ڕۆژ دووای ئەم ڕووداوە کۆچی دوایی کرد.

لەچۆنیەتی مەرگی ئەو ناسازگاری دەبینرێت. دەڵێن: ڕاوی دەکرد و سەگە ڕاوچییەکانی ئاسکێکیان گرت. ئاسکەکەی پەنای بردە کەلاوەیەك و سەگەکان دوای ئەو و دواتر سوارەکان هاتنە ناو کەلاوەکە. مەهدی خۆی مەبەستی کرد

بڕواتە ناو کەلاوەکە بەڵام پشتی شکا و ئەمە بووە هۆکاری مردنی.

هەروەها دەڵێن: کەنیزێك لەکەنیزەکانی گۆزەیەکی ژەهراوی بۆ هەوێکەی خۆی نارد، مەهدی لێی خوارد. کەنیز لەئاگادار کردنەوەی مەهدی ترسا و بەمشێوەیە مرد.

وەك دەڵێن: حەسەنە کەنیزەکەی ئەو هەرمێیەکی پێشکەش بەکەنیزێکی دیکە کرد کەمەهدی رووی خۆشی نیشان نەدەدا. ئەو، ئەم هەرمێیەی ژەهراوی کرد و خستیە بەرچاوی مەهدی. مەهدی کەحەزی لەهەرمێ بوو، داوای کرد و بەمشێوەیە هەرمێ ژەهراوییەکەی خوارد. هەر ئەوەندەی هەرمێکەی خوارد، هاواری لێ بەرز بوویەوە. ئەو کەنیزە دەنگی بیست و لەکاتێکدا لەسەر و روخساری خۆی دەدا، دەیوت: دەمویست تەنیا بۆ خۆم بیت، بەڵام بوومە هۆکاری مەرگی تۆ. مەهدی هەمان رۆژ مرد. حەسەنە گەڕایەوە و ئاڵای ڕەشی لەسەر بانیماڵەکەی هەڵکرد. باوکی ئەلعەتاهییە لەمبارەوە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| رحن فی الوشی و اقبلـــ | ن علیهن المسوح |
| کل نطاح من الدنـــ | ـــیا له یوم نطوح |
| لست بالباقی و لو عمـــ | ـــرت ما عمر نوح |
| فعلی نفسك نح ان | کنت لابید تنوخ |

واتاکەی: لەگەڵ زێر و زیو ڕۆشتن و بەجل و بەرگی ڕەش گەڕانەوە. هەر نائارامێك لەدنیا رۆژگارێکی نائارام دەبینێت، نائارام لەدنیا هەمیشەیی نابیت هەرچەند بەئەندازەی نوح زیندوو بیت و ئەگەر ناچاری لەگریان، کەواتە بۆ خۆت بگری.

مەرگی ئەو لەبیست و دووی موحەرەم/١٣ ئۆکتۆبەر روویدا و دە ساڵ ویەك مانگ و بەوتەیەك دە ساڵ وچل و نۆ رۆژ خەلافەتی کرد. ساڵەکانی تەمەنی، چل و سێ بەهار درێژەی کێشا و چاوی لەجیهان بەست. لەژێر ئەو دارگوێزەدا بەخاك سپێردرا کە لەژێریدا دەحەوایەوە. ڕەشیدی کوڕی نوێژی لەسەر خوێند. ئەو، سپی بوو. هەروەها دەڵێن: گەنم رەنگ بوو. لەیەکێك لەچاوەکانی پەڵەیەکی سپی دەبینرا.

## بەشێك لەكردەوەكانی مەهدی

هەركات مەهدی بۆ دادخوازی دادەنیشت، داوەرەكانی لای خۆی كۆدەكردەوە و دەیوت: ئەوەندە بەسە دادی من بۆ خەڵكان لەسەر بنەمای شەرم كردن لەم داوەرانە بێت.

مەهدی یەكێك لەسالارەكانی خۆی بەبەردەوامی سەركۆنە دەكرد و پێی دەوت: گوناح تا كەی؟ ئەو سالارە لەوەلآمدا دەیوت: ئێمە بەردەوام گوناح دەكەین و خواوەند ئەمیر پایەدار دەكات تا لەگوناحەكەی ئێمە خۆش ببێت. مەهدی شەرمی لێدەكرد و بەبیستنی ئەم قسە شادمان دەبوو.

میسوەر كوڕی مساویر دەڵێت: كارگوزارەكەی مەهدی ستەمی لێكردم و پارچەی زەوییەكەی منی زەوت كرد. نامەیەكم بۆ دادخوازی بۆ مەهدی نووسی. نامەكە كاتێك بەدەستی گەیشت كەمامی عەباس و محەممەد كوڕی عولاسە و عافیەی دادیار لای ئەو دانیشتبوون. مەهدی بانگی كرد و سەبارەت بەچۆنییەتی ئەو كارە پرسیاری لێكردم. وەلآمم دایەوە. وتی: ئایا بەداوەری یەكێك لەم دوو كەسە رازیت؟ وتم: بەڵێ. ئەوەندە منی لەخۆی نزیك كردەوە كەگەیشتمە شوێنی دانیشتنی ئەو. یەكێك لەو دووانە لێكۆڵینەوەی لەكارەكەی من كرد و بەمەهدی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران زەوییەكەی بۆ بگەڕێنەرەوە. مەهدی وتی: ئەو كارە دەكەم. عەباسی مامی وتی: سوێند بەخوا بەهای ئەم دانیشتنە بۆ من زیاتر لەبیست هەزار درهەمە.

رۆژێك مەهدی لەگەڵ موالییەكەی خۆی عومەر كوڕی رەبیع بۆ گەشت وگەڕان رۆشتەدەر. ئەو دووانە بەمەبەستی راو لەسوپاكەیان دوور كەوتنەوە. برسییەتی تەنگی بەمەهدی هەڵچنی، بەرەبیعی وت: ئایا خواردنت پێیە؟ پێی وت: قۆخێك (گوندێكی زۆر بچوك) دەبینم. روویان لەقۆخەكە كرد. پیاوێكی نبتی لەوێ دەژیا. كەمێك سەوزی هەبوو. سلآویان بۆ نارد و ئەویش وەلآمی دانەوە. وتیان: ئایا لای

تۆ خواردنمان دەست دەکەوێت؟ وتی: خواردنێکم هەیە لەجۆی ماسی ئوشنه[°] نانی جۆیشم هەیە. مەهدی وتی: ئەگەر ڕۆنیشت هەبێت، هیچت کەم نییە. وتی: بەڵێ، هەمە، توریشی لێیە. ئەو پیاوە خواردنەکانی خستە بەردەمیان و ئەوەندەیان خوارد تا تێر بوون. مەهدی بەعومەر کوڕی ڕەبیعی وت: لەمبارەوە هۆنراوەیەك بڵێ، عومەر وتی:

ان من يطعم الربيثاء بالزيـ ت و خبز الشعير بالكرات

لحقيق بصنعة او بثنتيـ ن لسوؤ الصنيع او بثلاث

واتاکەی: هەرکەس خواردنی لەو شێوە و ڕۆن و نانی جۆ و توری هێنایە پێش، شیاوی دوو یا سێ قامچی بۆ ئەم خراپەکارییە.

مەهدی وتی: ناڕاستت هێنایە سەرزمان، دەبوا بڵێی:

لحقيق ببدرة او بثنتيـ ـن لحسن الصنيع او بثلاث

واتاکەی: شیاوی دوو یا سێ هەمانە زێر بۆ ئەم چاکەکارییەیە.

سوپاکەیان لەگەڵ خەزێنە و خزمەتکاران گەیشتن و مەهدی فەرمانیدا سێ هەمانە زێر بەو پیاوە نبتیە بدەن. دواتر ئەو شوێنەیان بەجێهێشت.

حەسەنی وەسیف دەڵێت: لەرۆژگاری مەهدی بایەکی سەخت بەسەر ئێمەدا هەڵیکرد، بەشێوەیەك گومانمان کرد ئەم بایە ڕۆژی کۆتایی بەدواوەیە. بەبینینی مەهدی هاتمەدەر، بینیم سەر لەخاك دەسوێت و دەڵێت: خواوەندا! ئۆمەتی محەممەد بپارێزە، خواوەندا! بەلەناو بردنی ئێمە دوژمنانمان شاد مەکە، ئەی خواوەندا، ئەگەر جیهانت بەهۆی گوناحەکانی منەوە گرفتار کردووە، ئەوە قژی نێوچاوانی منە لەدەستی تۆدایە.

وەسیف دەڵێت: زۆری نەخایاند با هێور بوویەوە و دژواری سەر شانی ئێمە کۆچی کرد.

لەکاتی مردنی قاسم کوڕی موجاشعی تەمیمی، وەسیەت نامەکەی خۆی بەمشێوەیە بۆ مەهدی نووسی: خواوەند و فریشتەکان و زاناکان شایەتی دەدەن خوایەك جگە لەو بوونی نییە. قاسمیش بەهەمان شێوە شایەتی دەدات، بەهەمان

---

[°] sardine

شێوە کەشایەتی دەدات محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب جێگری ئەو بۆ خەلافەت. دوای مەرگی ئەو وەسیەت نامەکەیان تەسلیمی مەهدی کرد، کاتێك دوا دێری ئەم وەسیەت نامەی خوێندەوە، فڕیدا و چیتر سەیری نەکرد.

ڕەبیع دەڵێت: لەشەوێکی مانگە شەو بینیم مەهدی لەناو تالاری نوێژگە، نوێژ دەخوێنێت، بەشێوەیەك نەمدەزانی ئەو جوانترە یا تالار یا مانگ یا جلەکانی ئەو. ئەم ئایەی دەخوێندەوە: ئەی دوو ڕووەکان، هیوادارن کاتێك گەڕانەوە، لەزەوی خراپەکاری بکەنە پیشە و پەیوەندییەکانتان بپچڕێنن.

دەڵێت: نوێژەکەی تەواو کرد، ڕووی کردە من و وتی: ئەی ڕەبیع! وتم: فەرمانبەرم. وتی: موسا بێنەرە لای من. بیرم کردەوە کەموسا کێیە؟ کوڕەکەی یا موسا کوڕی جەعفەر کەزیندانی منە؟ بیرم کردەوە و بەخۆم وت بەدڵنیاییەوە دەبێت موسا کوڕی جەعفەر بێت. ئەوم بردە لای. مەهدی نوێژەکەی بڕی و وتی: ئەی موسا، ئەم ئایەم خوێند، ترسام لەوەی پەیوەندی خۆمم پچڕاندبێت، ئاسوودەم بکە کەدژی من قوت نابیتەوە. موسا ڕازی بوو و مەهدی ئازادی کرد.

محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: لەکۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی مناڵەکانی ئومەییە لەخەودا بینیم ڕۆشتوومەتە ناو مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ). سەرم بەرز کردەوە و لەلێوارەکانی دیواری مزگەوتەکە ئەم نووسراوەم بینی: لەفەرمانەکانی سەرورەری باوەڕداران وەلید کوڕی عەبدولمەلیك. لەناکاو دەنگێك بەرز بوویەوە: ئەم نوسراوەیە دەسڕدرێتەوە و پیاوێك لەکوڕەکانی هاشم ناوی خۆی لەجێگەی ئەو دەنووسێت کەبە محەممەد ناوی دەبەن. وتم: من لەکوڕەکانی هاشمم و بە محەممەد بانگم دەکەن. ئەو مناڵی کێیە؟ وتی: مناڵی عەبدوالله. وتم: منیش مناڵی عەبدواللەم. عەبدوالله مناڵی کێیە؟ وتی: مناڵی محەممەد. وتم: منیش لەپشتی محەممەدم؟ ئەو مناڵی کێیە؟ وتی: عەلی. وتم: منیش لەتۆوی عەلیم، ئەو مناڵی کێیە؟ وتی: عەبدوالله. وتم: منیش لەمناڵەکانی ئەوم، ئەو مناڵی کێیە؟ وتی: کوڕی عەباس. ئەگەر ئەو دەنگە ناوی کوڕی عەباسی نەدەهێنا، دڵنیا بووم لەوەی

من لەسەر تەختی خەلافەت دادەنیشم.

دەڵێت: لەو ڕۆژگارەدا ئەم قسەیەم لای یەکێك لەهاوڕێکانم باس کرد، هێشتا کەسمان مەهدیمان نەدەناسی. ئەو هاتە سەر تەختی خەلافەت و ڕۆژێك ڕۆشتە مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ)، سەری خۆی بەرز کردەوە و ناوی وەلیدی بینی. وتی: تا ئێستا ناوی وەلید لەو شوێنەدا دەبینم. فەرمانیدا چوارپایەییێکیان بۆ هێنا، لەناو حەوشی مزگەوتەکە دانیشت و وتی: لێرە ناڕۆم تا ئەو ناوە دەسڕنەوە و ناوی من لەجێگەی ئەو دەنووسن.

شەوێك مەهدی بەدەوری کەعبەدا دەسوڕایەوە، لەناکاو هاواری ژنێکی بیابان نشینی بیست کەدەیوت: کەسەکانی من گرفتاری قاتوقڕی بوون، کانییاوەکانیان وشکی کردووە و پشتیان لەژێر قورسایی قەرزەکان شکاوە و ڕۆژگار ئازاریان دەدات، پیاوەکانیان لەناوچوون و سامانیان کەمی کردووە و ژن و منالەکانیان فراوان و بێ ژومار. یەك کەوتە و بێ دەرەتانین لەکاتێکدا وەسیەتی پێغەمبەرمان لەپشتە، ئایا کەس چاکەم لەگەڵ دەکات تا خواوەند چاکەی لەگەڵ بکات و بنەماڵەکەی لەزیان دوور بکاتەوە. مەهدی فەرمانیدا پێنسەد درەمی پێبدەن.

مەهدی دەڵێت: کەس بەو ئەندازەیە لەمن نزیك نەکەوتەوە کەچاکەکاری ڕابردووم بیر بخاتەوە و بەم هۆیەوە، چاکەیەکی دووبارە بەدەست بێنێتەوە. خۆبەدوور گرتنی داهاتووان لەبەخشین، پچڕانی سپاسگوزاری ڕابردووانی لێ دەکەوێتەوە.

بەشار کوڕی بورد، ساڵح کوڕی داوود برای یەعقوبی لەکاتی فەرمانڕەوایەتی بەسرە بەمشێوەیە سەرکۆنە کرد:

هم حملوا فوق المنابر صالحا          اخاك فضجت من اخيك المنابر

واتاکەی: ئەوان ساڵح، برای تۆیان بردە سەر مینبەرەکان و مینبەرەکان لەبراکەی تۆ بێزار بوون.

یەعقوب لەم سەرکۆنە کردنە ئاگادار بوویەوە. ڕۆشتە لای مەهدی و وتی: ئەم ناباوەڕە سەروەری باوەڕدارانی سەرکۆنە کردووە. مەهدی وتی: چی وتووە؟ یەعقوب وتی: سەروەری باوەڕداران دەبێت بمبەخشێت چوونکە ناتوانم وتەکانی

ئەو بێنمە سەرزمان. مەهدی پێداگری کرد و یەعقوب وتی:

خليفة يزنى بعماته يلعب بالدبوق و الصولجان

ابدلنا الله به غيره ودس موسا فى حر الخيزران

واتاکەی: خەلیفە لەگەڵ پورەکانی خۆی دەخەوێت لەکاتێکدا گەمە بەگۆی و چۆگان دەکات. خواوەند کەسێك جگە لەو بکاتە خەلیفەی ئێمە و موسا بگەڕێنێتەوە بۆ هەمان جێگەی خەیزەران کەلێی هاتۆتەدەر.

مەهدی کەسێکی بەدوای بەشار نارد. یەعقوب ترسا نەکات بەشار وەسفی بکات و مەهدی لەگوناحەی خۆش ببێت. لەبەر ئەمە کەسی نارد تا لەحەمار لەئاودا بیخنکێنێت.

یاقوتە کچی مەهدی مرد. مەهدی بەڕادەیەك کچەکەی خۆش دەویست نەیدەتوانی بەرگەی دووری ئەو بگرێت، هەمیشە جل و بەرگی کوڕانی لەبەر دەکرد و لەگەڵ خۆی بۆ ئەم لا و لای دەبرد.

کاتێك ئەو مرد، مەهدی فەرمانیدا کەس پێش نەخەن. هەموو خەڵکان بۆ دەربڕینی خەمی خۆیان دەهاتنە بەردەم بارەگای مەهدی. هەموو خەڵکان کۆك بوون لەسەر ئەوەی هیچ پرسە نامەیەك پوختتر و کورتتر لەپرسەنامەکەی شەبیب کوڕی سەیبەی نەهاتە سەرزمان. ئەو وتی:

ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوەی لای خواوەندە، باشتر و پاداشتی خواوەند بۆ تۆ چاکترە. داوا لەخوا دەکەم گرفتاری خەم و پەژارەت نەکات و بۆ ئەم پرسەیە سەبووریت پێ ببەخشێت و ئەم زیانە گومڕات نەکات و نەبێتە هۆی ئەوەی نیعمەتەکان پشت بکەنە تۆ. شیاوترین پێشهات بۆ خۆڕاگر ئەوەیە ڕێبوار نەتوانێت لێی بگەڕێتەوە.

## ئاماژەدان بەخەلافەتی مەهدی

لەو ڕۆژەی مەهدی مرد، بۆ کوڕەکەی موسای هادی بەیعەت وەرگیرا. ئەو لەم کاتەدا لەجورجان لەگەڵ خەڵکانی تەبەرستان دەجەنگا. لەکاتی مەرگی مەهدی لەماسەبزان ڕەشیدی لەگەڵدا بوو. موالییەکان و فەرماندەکان ڕۆشتنە لای و وتیان:

ئاگادار بوونی سوپاییەکان لەمەرگی مەهدی ئەگەری هەیە شۆڕشی بەدواوە بێت. باشترە فەرمانی گەڕانەوەیان پێ بدەین تا جەنازەی مەهدی لەبەغداد بەخاك بسپێرین.

هارون وتی: باوکی یەحیا کوڕی خالید بانگ بکەن. یەحیا فەرمانڕەوایی ناوچەکانی دەوروبەری مەراکش لەئەنبارەوە تا ئەفریقییەی دەکرد کە سنووری ژێر دەسەلاتی ڕەشید بوو. یەحیایان هێنایە لای ڕەشید. هارون پێی وت: سەبارەت بەهەواڵەکانی ئەم دەستەیە بۆچوونت چییە؟ یەحیای لەباس و خواسەکان ئاگادار کردەوە. یەحیا وتی: ئەم کارە بەباش نازانم چوونکە پێشهاتێکی لەمشێوە شاراوە نامێنێت و ئەگەر سەربازەکان ئاگادار ببنەوە ئەگەری هەیە دەست بەسەر جەنازەکەدا بگرن و تا وەرگرتنی مووچەی سێ ساڵ، نەیگەڕێننەوە. بۆ ئەم مەبەستە زۆر بەکار دەبەن و شۆڕش دەست پێدەکات. باشترە لێرە بەخاکی بسپێرین و نەسیر لەگەڵ ئەنگوستیلە و داردەستی خەلافەت بۆ لای سەروەری باوەڕداران و جێگری خەلیفە، هادی ڕەوانە بکەیت تا چیتر هەست بەمەترسی تۆنەکات و خەلافەتی خۆی بەپیرۆز بزانێت. خەڵکانیش لەهاتنەوەی ئەو نارازی نابن. فەرمان بدە بەو سەربازانەی شوێنکەوتەی تۆن، دووسەد درەم بدەن و پێشنیاری گەڕانەوەیان پێ بکەن چوونکە ئەم دەستەیە تەنیا خوازیاری پەیوەست بوون بەبنەماڵەکانی خۆیانن.

هارون ئەم کارەی کرد. کاتێك سەربازەکانی دوو سەد درەمەکەیان وەرگرت، هاواری بەغداد، بەغدادیان بەرز کردەوە. ڕەبیع ڕۆشتە سەردانی خەیزەران بەلاَم یەحیا لەبەر ترس لەهادی لەڕۆشتن بۆ لای ئەو خۆی بەدوور گرت و بەئەندازەیەك درەم و دیناری کۆکردەوە تا بتوانێت مانگانەی دوو ساڵی سەربازەکانی بدات و بەمشێوەیە سەربازەکان ملکەچ و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. هادی نامەیەکی بۆ ڕەبیع نووسی و هەڕەشەی کوشتنی لێکرد چوونکە سەردانی دایکی کردبوو. ئەویش نامەیەکی بۆ یەحیا نووسی و سپاسی کرد و فەرمانی پێدا ڕاوێژکاری هارون پەسەند بکات.

ڕەبیع یەحیای خۆش دەویست و ئەوی بەگەورەی خۆی لەقەڵەم دەدا. ترسی

خۆی لەهادی لەگەڵ ئەودا باس کرد. یەحیا پێشنیاری پێکرد کوڕەکەی لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی بۆ لای هادی ڕەوانە بکات تا لەڕێگە بیبینێت و داوای بەخشینی لێبکات. ڕەبیع ئەو کارەی کرد و هادی لێیخۆش بوو.

ڕەبیع هاوکاری یەحیا کوڕی خالیدی دەکرد و لەبەغداد بۆ هادی بەیعەتیان وەرگرت. ڕەشید هەواڵی مەرگی مەهدی و وەرگرتنی بەیعەت بۆ هادی بەهەموو ناوچە ئیسلامییەکان گەیاند. نەسیر وەسیف ڕۆشتە جورجان و هەواڵی مەرگی مەهدی و بەیعەت بۆ هادی بەو سەرزەمینە گەیاند. هادی فەرمانی بەهەمووواندا ڕێگەی بەغداد بگرنەبەر و خۆی ئەوەندە خێرا ڕێگەی بڕی لەماوەی بیست ڕۆژ گەیشتە بەغداد و هەمان سات ڕەبیعی وەك وەزیر دەستینشان کرد. لەم ساڵەدا ڕەبیع مرد.

لەم ساڵەدا بوو مەهدی بۆ لەناو بردنی زەندیقییەکان هەوڵی زۆریدا و دەستەیەك لەوانی لەناو خوێنی خۆیاندا گەوزاند کەعەلی کوڕی یەقتین یەکێك بوو لەوان، هەروەها یەعقوب کوڕی فەزل کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەباس کوڕی ڕەبیعە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب لەم ناوەدا کوژرا. چۆنیەتی مەرگی ئەو بەمشێوە بوو: ئەویان بردە بارەگای مەهدی و دانی بەزەندیقی خۆیدا نا. مەهدی وتی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێت، شیاو بوو بۆ محەممەد(ص) دەمارگیر بێت و ئەگەر محەممەد نەبێت، تۆ کێیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر پەیمانم بەخۆم دەدا یەك کەس لەهاشمییەکان نەکوژم، تۆم هەر دەکوشت. مەهدی لەوەسیتنامەکەی بۆ هادی نووسیبوو: سوێندت دەدەم ئەگەر لەسەر ئەم تەختە دانیشتیت، یەك هەینی لەخوێنی ئەو خۆش مەبە. ئەوی زیندانی کرد. کاتێك مەهدی مرد، هادی خوێنی ڕشت. مەهدی لەوەسیەت نامەکەی خۆی داوای لەهادی کردبوو منداڵەکانی داود کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس بکوژێت چوونکە ئەوانیش زەندیقی بوون. ئەو لەزیندان پێش مردنی مەهدی مرد.

کاتێك یەعقوب کوژرا، منداڵەکانی ئەویان بردە لای هادی و فاتیمەی کچی دانی بەوەدا نا لەباوکی دووگیانە. بەڕادەیەك کچەکەیان ترساند کەمرد.

دەرکەوتنی حسەین کوڕی عەلی کوڕی حەسەن

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەدینە دەرکەوت. ئەو، هەمان کوژراوی فەخ لەنزیکی مەککەیە.

هۆکاری بزوتنەوەکەی ئەمەیە: هادی، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی خەتابی وەك فەرمانداری مەدینە دەستنیشان کرد. کاتێك عومەر فەرمانداریی ئەوشارەی گرتەدەست، باوکی زەفت حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن و موسلیم کوڕی جوندەب شاعیری هوزەلی و عومەر کوڕی سەلام موالی بنەماڵەی عومەری بەگوناحی مەی خواردنەوە گرت و قامچی بارانی کردن. دواتر پەتی کردە ملیان و بەناو شاری مەدینەدا ئەوانی سووڕاند. حسەین کوڕی عەلی ڕۆشتە لای عومەر و پێی وت: تۆ بەگوناحی خواردنەوە ئەوانت قامچی باران کرد و نەدەبوا ئەو کارە بکەیت، چوونکە خەڵکانی عێراق خواردنەوەی مەی بەڕەوا دەزانن، هەنووکە بڵێ بۆ ئەوانت بەناو شاردا سوڕاند؟ عومەر فەرمانی گەڕانەوەی ئەوان و زیندانی کردنی ئەوانیدا.

حسەین کوڕی عەلی و یەحیا کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن بوونە دەستەبەری حەسەن کوڕی محەممەد و ئازادیان کرد. ژمارەیەکی دیکە لەبنەماڵەی ئەبوتالیب چەند کەسێکی دیکەیان ئازاد کرد. زیندانییە ئازاد کراوەکان دەبوا هەموو ڕۆژێك خۆیان بناسێنن. حەسەن کوڕی محەممەد دوو ڕۆژ ئەو کارەی نەکرد. عومەر، حسەین کوڕی عەلی و یەحیا کوڕی عەبدوالله (دەستەبەرەکانی) بانگ کرد و سەبارەت بەحەسەن کوڕی محەممەد پرسیاری لێکردن. یەحیا سوێندی خوارد نەڕواتە ناو جێگە تا ئەو کاتەی تەقە لەدەرگای عومەر دەدات و دەڵێت: حەسەنم هێناوە.

کاتێك ئەو دووانە لای کوڕی عومەر ڕۆشتنەدەر، حسەین بەیەحیای وت: بەپاکی یادی خواوەند دەکەم! چ شتێك بۆ ئەم کارە ناچاری کردیت؟ لەکوێ حەسەن دەدۆزیتەوە؟ سوێندێکت خوارد کەناتوانی بەجێی بێنیت. یەحیا لەوەڵامدا وتیك سوێند بەخوا ناڕۆمە جێگە تا بەشمشێر لەدەرگای ماڵەکەی دەدەم. حسەین پێی وت: ئەمە پەیوەندی نێوان ئێمە و هاورێکانمان دەپچڕێنێت.

ئەوان بڕیاریاندا بوو لەکاتی حەج لەمەنی و مەککە کۆببنەوە و بزوتنەوەکەی خۆیان دەست پێبکەن. یەحیا وتی: منیش لەم پەیمانەدا بەشدارم. ئەو دووانە کۆتاییەکانی هەمان شەو بزوتنەوەکەی خۆیان ئاشکرا کرد. یەحیا ڕۆشتە بەردەم ماڵی عومەر بەڵام ئەوی نەبینی. بەرەبەیان هەموویان هاتن و لەمزگەوتی مەدینە کۆبوونەوە. حسەین نوێژی بەیانی خوێند وخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سونەتی پێغەمبەر (د.خ) بەیعەتیان لەگەڵ بەست. لەم کاتەدا خالیدی بەریدی لەگەڵ دووسەد سەرباز هات و عومەر لەگەڵ وەزیر کوڕی ئیسحاقی ئەزەرق و محەممەد کوڕی واقیدی شەروی و خەڵکانێکی زۆر هاتن. خالید لەدەستەکەی یەحیا نزیك کەوەتەوە. یەحیا و ئیدریس و منداڵەکەی عەبدوالله کوڕی حەسەن هەستان. یەحیا بەیەك زەربە خالیدی لەپێ خست و ئیدریس لەپشتەوە هێرشی کردە سەر یەحیا و ئەوی لەخوێنی خۆیدا گەوزاند. هەردووکیان ئەویان کوشت و شکستیان بەهاوەڵەکانی هێنا.

عومەر ڕۆشتە کەنارەکانی شار و هاوەڵانی حسەین هێرشیان کردەسەر و شکستیان پێهێنان و گەنجینەی شارەکەیان تالان کرد. لەناو گەنجینە زیاتر لەدە هەزار دینار و بەگومانێك حەفتا هەزار دینار تالان و لەناو خەڵکاندا دابەش کرا. خەڵکانی مەدینە دەروازەکانیان بەست.

بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە، شوێنکەوتەکانی منداڵەکانی عەباس دژی ئەوان ڕاپەڕین و جەنگ دەستی پێکرد. بریندارەکان لەهەر دوولا زیادی کرد و تا نیمەڕۆ شەڕ بەردەوام بوو. لەکاتی نیمەڕۆ هەر دوو سوپاکە بڵاوەیان لێکرد. بەیانی ئەو ڕۆژە موبارەکی تورکی کە لەحەج دەگەڕایەوە، ڕۆشتە لای شوێنکەوتەکانی منداڵەکانی عەباس و شان بەشانی ئەوان تا نیمەڕۆ جەنگا. دواتر هەر دوو سوپا بڵاوەیان لێکرد و هاوەڵانی حسەین ڕۆشتنە ناو مزگەوتەکە. موبارەك لەگەڵ خەڵکان هات و مەبەستی هەڵگیرساندنەوەی جەنگی کرد. بەڵام هەر ئەوەندەی هاوەڵانی موبارەك ئاگا بوون، سوار وشترەکەی بوو و هەڵات. خەڵکان شوێنی کەوتن بەڵام هیچ نیشانەیەکیان لەو نەبینی.

دەڵێن: موبارەك پەیکی بۆ لای حسەین نارد و پێی وت: ئەگەر لەئاسمان

بکەومەخوار و جەستەم تیکە تیکە بێت و ببێتە خواردنی لاشخۆرەکان، بۆ من ئاسانتر لەوەی چقڵێك قاچی تۆ بریندار بکات یا تاڵێك موو لەجەستەت کەم ببێتەوە بەڵام دەبێت بمبەخشیت. ئەمشەو بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەسەر من و شکستم پێ بێنە. ئەو حەسەنی بۆ جەنگی موبارەك نارد. کاتێك لەئوردووگاکەی موبارەك نزیك کەوتنەوە، دەنگی تەکبیریان بەرز کردەوە و بەمشێوەیە موبارەك و سوپاکەی شکستیان خوارد.

حسەین و هاوەڵانی چەند رۆژێك ساز وبەرگی شەڕیان کۆکردەوە. مانەوەی ئەوان لەمەدینە یانزە ڕۆژی خایاند. دواتر لەبیست و چواری زیقەعدە/٢٨ مەی لەمەدینە ڕۆشتنەدەر. کاتێك ئەوان لەمزگەوت هاتنەدەر، خەڵکان ڕۆشتنە ناو مزگەوت و نفرینیان کردن.

کاتێك حسەین مەبەستی هاتنە دەرەوە لەمەدینەی کرد، وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، هیوادارم خواوەند هیچ کات نەتانبەخشێت. خەڵکانیش وتیان: هیوادارین ئەخوا بتبەخشێت ئەجارێکی دیکە بۆ لای ئێمە بگەڕێیتەوە. هاوەڵانی ئەو بەناچاری لەناو مزگەوتەکە پیسابیان دەکرد و دواتر خەڵکانی مەدینە ئەو شوێنەیان کردە ئاودەست خانە.

ئەو رۆژەی حسەین ڕۆشتە مەککە، دەنگی بەرز کردەوە: هەر کۆیلەیەك بێتە ناو سوپاکەی ئێمە، ئازادە و بەمشێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەکۆیلەکان پەیوەستیان بوون. هادی لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە. لەو کاتەدا ژمارەیەك لەئەندامانی بنەماڵەکەی حەجییان دەکرد. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: سلێمان کوڕی مەنسور، محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی، عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی و موسا و ئیسماعیل دوو منداڵەکەی عیسا کوڕی موسا. هادی نامەیەکی بۆ محەممەد کوڕی سلێمان نووسی و ئەوی وەك فەرماندەی جەنگ دەستنیشان کرد. ئەو لەترسی چەتە و رێگرەکان کەل و پەلی شەڕی لەگەڵ خۆیدا بردبوو. ئەوان لەوادی (توی) کۆبوونەوە بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ حەجی عەمرە کۆببوونەوە، بۆ سووڕانەوە بەدەوری ماڵی خوا ڕۆشتنە ناو مەککە، کاتێك حەجی عەمرەیان بەجێهێنا، دووبارە لەتوی کۆبوونەوە و ئوردوویان لێدا. موالییەکان و ئەو

فەرماندانەی ڕێ ورەسمی حەجیان بەجێ دەهێنا، پەیوەستیان بوون.

دوو سوپا لەڕۆژی ترویە (هەشتی زیحەججە) ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. هاوەڵانی حسەین شکستیان خوارد و دەستەیەکیان لێ کوژرا و بریندار بوون. محەممەد کوڕی سلێمان و هاورێکانی ئەو بێ ئاگادار بوون لەحسەین بۆ مەککە گەڕانەوە. کاتێك گەیشتنە وادی توی، پیاوێك لەخوراسانییەکان ئەوانی بینی و هاواری کرد: مژدە، مژدە ئەمە سەری حسەینە. کاتێك سەرەکەی بردە پێش، برینێکی قووڵ لەنێوچاو و برینکی دیکە بەپشتیەوە بوو. هەمووان داوای ئەمانیان کرد. حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوالله (باوکی زوفت) لەپشت محەممەد کوڕی سلێمان و عەباس کوڕی محەممەد ( لەناو ئەوکەسانەی داوای ئەمانیان دەکرد) وەستابوو. موسا کوڕی عیسا و عەبدوالله کوڕی عەباس کوڕی محەممەد ئەویان گرت و خوێنیان ڕشت. محەممەد کوڕی سلێمان بۆ ئەم کارە زیاد لەڕادە تورە بوو و سەری کوژراوەکانی هەڵگرت. ژمارەی سەرە بڕاوەکان لەسەد تێپەڕی دەکرد. سەری حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی لەناویاندا دەبینرا. خوشکەکەی حسەین کەزێنەب کچی سلێمانی سپێردرابوو، لەناو دیلەکاندا دەبینرا. تێکشکاوەکان تێکەڵ بەحاجییەکان بوون. شەش ئەسیریان بردە لای هارون. چەند کەسێکیانی کوشت و ئەوانی دیکەی ئازاد کرد. لەموسا کوڕی عیسا تورە بوو چوونکە خوێنی حەسەن کوڕی محەممەدی ڕشتبوو. هادی دەستی بەسەر سامانەکانیدا گرت و ئەم سامانە تاکاتی مەرگی هادی لەدەستی ئەودا بوو. هادی لەموبارەکی تورکیش تورە بوو و سامانی ئەویشی زەوت کرد و ئەوی کردە سەرپەرەستی ئەسپەکانی.

لەتێکشکاوەکان ئیدریس کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی هەڵات و ڕووی کردە میسر. خاوەنی بریدی ئەو سەرزەمینە وازح موالی ساڵح کوڕی مەنسور لەشیعەکانی عەلی بوو. ئەو ئیدریسی بەپەیك گەیاندە مەغریب و لەتەنجە لەشاری وەلیلە نێشتەجێی کرد. بەربەرەکانی ئەو سەرزەمینە پێشوازییان لێکرد. هادی سەری وازحی لەجەستە جیا کردەوە و چوار مێخەی کێشا.

دەڵێن: ڕەشید ئەوی کوشت بەمشێوە کە شەماخی یەمامی موالی مەهدی بەشێوەیەکی نهێنی بۆ لای ئیدریس نارد. شەماخ وای نیشاندا کە لەشوێنکەوتەکانی ئیدریسە. شەماخ ئەوی بەگەورە دەزانی و ڕێزی لێدەگرت و بەمشێوەیە ئیدریس لێی نزیك کەوتەوە و لەماڵەکەی خۆیدا جێگەی کرد. ڕۆژێك ئیدریس لەتاو ئازاری ددانی دەیناڵاند. شەماخ دەرمانێکی بۆ ئامادە کرد بەڵام پێشتر ژەهراوی کرد و پێی وت تا بەرەبەیان ئەو دەرمانە لەسەر ددانت دابنێ. ئیدریس دەرمانەکەی وەرگرت و شەماخ هەڵات. ئیدریس هەر ئەوەندە دەرمانەکەی خستە سەر ددانی، مرد. ڕەشید شەماخی وەك خاوەنی بەریدی میسر دەستنیشان کرد.

کاتێك ئیدریس کوڕی عەبدوڵلە مرد، منداڵەکەی ئیدریس کوڕی ئیدریس جێگەی باوکی گرتەوە. منداڵەکانی ئەو فەرمانڕەوایەتی مەغریبیان دەکرد و بۆ فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینە لەگەڵ منداڵەکانی ئومەییە بەردەوام لەجەنگدا بوون. دواتر بەخواستی خوا ئاماژە بەم جەنگانە دەدەین.

سەرە بڕاوەکانیان بردە بارەگای هادی. کاتێك سەری حسەینیان خستە بەردەم هادی، وتی: دەڵێی سەری ستەمکارێك لەستەمکارە گەورەکانتان بۆ هێناوم. کەمترین سزای ئێوە ئەوەیە پاداشتان پێ نەدەم. پاداشتی بەوان نەدا.

حسەین پیاوێکی بوێر وبەخشندە بوو، کاتێك هاتە لای مەهدی، چل هەزار دیناری پێ بەخشی و ئەویش لەناو خەڵکانی بەغداد کوفە دابەشی کرد بەشێوەیەك کاتێك کوفەی بەجێهێشت تەنیا عابایەکی چەرمینی لەبەردا بوو بێ ئەوەی لەژێرەوە هیچی لەبەردا بێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەعیوب کوڕی یەحیا لەدەرب ئەلراهب، جەنگی هاوینەی ئەنجامدا. زۆرینەی ڕۆمییەکان لەگەڵ بەتریرك هاتبوونە حەدەس. کارگوزار و بازارییەکانی ئەو سەرزەمینە هەڵاتبوون و ڕۆمییەکان ڕۆشتبوونە ناو شارەکە. مەعیوب مەبەستی ئەوانی کرد و گەیشتە شاری ئۆشنە و هەموو سامانەکانی ئەو شارەی

تالاَن و خەڵکەکەی ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی مەنسور ئاییینی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

فەرمانداری مەدینە، عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی عومەری، فەرمانداری مەککە و تاییف عوبەیدالله کوڕی قوسەم، فەرمانداری یەمەن ئیبراهیم کوڕی سەلم کوڕی قوتەیبە، فەرمانداری یەمامە و بەحرەین سوەید کوڕی باوکی سوەیدی قائیدی خوراسانی، فەرمانداری عومان، حەسەن کوڕی نەسیمی حەواری، فەرمانداری کوفە، موسا کوڕی عیسا، فەرمانداری بەسرە، محەممەد کوڕی سلێمان، فەرمانداری جورجان حەجاج موالی هادی، فەرمانداری قومس زیاد کوڕی حەسان، فەرمانداری تەبەرستان و رویان ساڵح کوڕی شێخ کوڕی عومەیرەی ئەسەدی، فەرمانداری ئیسفەهان تەیفور موالی هادی، فەرمانداری موسڵ هاشم کوڕی سەعید کوڕی خالید بوو کەخراپەی لەگەڵ خەڵکانی ئەوشارە کرد و هادی ئەوی لەسەر کار دوور خستەوە و عەبد مەلیك کوڕی ساڵحی هاشمی لەجێگەی ئەودەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا حەمزە کوڕی مالکی خوزاعی لەجەزیرە ئالاَی شۆڕشی بەرز کردەوە. فەرمانداری جەزیرە لەم کاتەدا مەنسور کوڕی زیاد بوو. ئەو سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی حەمزە ڕەوانە کرد. دوو سوپا لەباعەربایا لەدەورووبەری موسڵ لەبەرابەر یەك ریزیان بەست. حەمزە توانی شکستیان پێ بێنێت و سامانەکانیان تالاَن بکات. لەم کاتەدا دوو پیاو بۆ گفتوگۆ کردن ڕۆشتنە لای بەلاَم لەناکاو هێرشیان کردە سەر و خوێنیان ڕشت.

هەروەها لەم ساڵەدا موتیع کوڕی ئەیاسی لەیسی کەنانی شاعیر و باوکی عوبەیدالله معاویە کوڕی عەبدوالله کوڕی بەشاری ئەشعەری، پیشەوای ئەشعەرییەکان، کەوەزیری مەهدیش بوو، مردن. دەستەیەك دەڵێن ئەو لەساڵی ٧٦٨/١٧٠ زاییینی مردووە.

لەم ساڵەدا نافیع کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی باوکی نوعەیمی موقەری یەکێك لەحەوت قورئان خوێنەکە و رەبیع کوڕی یونسی پەردەدار و موالییەکەی مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتای کۆچی ( ٧٦٨ زایینی )

## چۆنیەتی لەسەر کار لابرانی ڕەشید لەلایەن هادی

هادی بۆ لابردنی ڕەشید و وەرگرتنی بەیعەت بۆ جەعفەری کوڕی بەردەوام هەوڵی دەدا. کاتێك هادی مەبەستی لەسەر کار لابردنی ڕەشیدی کرد، فەرماندەکانی خۆی ئاگادار کردەوە. یەزید کوڕی مەزیدی شەیبانی و عەبدوالله کوڕی مالك و عەلی کوڕی عیسا و دەستەیەکی دیکە ڕەزامەندی خۆیان نیشاندا. هارونیان لەسەر کار لابرد و بەیعەتیان لەگەڵ جەعفەر بەست. ئەوان شوێنکەوتەکانی مناڵەکانی عەباسیان کۆکردەوە و لەمبارەوە قەسیان بۆ کردن و لەهەمان دانیشتن سەرکۆنەی ڕەشیدیان کرد و لەبەهاکانی ئەویان کەم کردەوە. دەستەیەك لەمناڵەکانی عەباس ڕازی نەبوون. بارودۆخ دژوار بوو. هادی فەرمانیدا نیشانەی جێگری خەلیفە لەڕەشید بستێنن. خەڵکانیش خۆیان لەڕەشید بەدوور دەگرت و سڵاویان لێنەدەکرد.

یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك بەفەرمانی هادی کاروبارەکانی ڕەشیدی ڕادەپەڕاند. بەهادییان وت: ڕەشید خۆی ناسازگار نییە و ئەوە یەحیایە بۆ ناسازگاری تۆ هانی دەدات. هادی، یەحیای بانگ کرد و ئەوی ترساند و نارەزامەندی خۆی نیشاندا.

شەوێك هادی یەحیای بۆ بارەگاکەی خۆی بانگ کرد. یەحیا ترسا. وەسیەت نامەی نووسی و کافوری لەخۆیدا و ڕۆشت. هادی پێی وت: یەحیا، چ شتێك لەنێوان من و تۆ ڕوودەدات؟ یەحیا وەڵامی دایەوە: لەبەندە تەنیا فەرمانبەری بۆ سەروەرەکەی شیاوە. هادی وتی: بۆ لەنێوان من و براکەم دوو بەرەکی دروست دەکەیت و بۆ دژایەتی کردنی من هانی دەدەیت؟ یەحیا وتی: چۆن دەتوانم دوو بەرەکی لەنێوان ئێوەدا بنێمەوە. مەهدی منی کردە ڕاوێژکاری ئەو، دواتر تۆیش ئەم کارەت بەمن سپارد و منیش فەرمانەکانی تۆ ئەنجام دەدەم. ڕق و توڕەیی هادی کەمی کردەوە.

هارون بە لەسەر کار لابرانی خۆی رازی بوو بەڵام یەحیا رێگەی ئەو کارەی لێدەگرت. کاتێك هادی، یەحیای بانگ کرد و لەمبارەوە لەگەڵی ئاخاوت، یەحیا پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر خەڵکان ناچار بکەیت، بەیعەتی خۆیان بشکێنن، چیتر پەیمان شکاندن بۆ ئەوان کارێکی ئاسان دەبێت، بەڵام ئەگەر بەیعەتی ئەوان بۆ براکەت پشت راست بکەیتەوە و دوای ئەو بۆ کوڕەکەت بەیعەت وەربگریت، کارێکی شیاوت ئەنجام داوە. هادی بەوتەکانی رازی بوو.

فەرماندەکان و ئەو کەسانەی بەیعەتیان لەگەڵ جەعفەر کردبوو، لەسەر قسەکانی خۆیان مانەوە و هادییان بۆ لەسەر کار لابردنی ڕەشید هاندا. ئەویەحیای بانگ کرد و زیندانی کرد. یەحیا بۆی نووسی: ئامۆژگارییەکم هەیە. هادی ئەوی بردە لای خۆی. یەحیا وتی: ئەی سەرورەی باوەڕداران! ئایا گومان دەکەیت لەکاتی هاتنی فەرمانێك کەخوا ئێمە زووتر لەتۆ بەو دەگەیەنێت ( یانی مەرگی تۆ) خەڵکان بەجێگری جەعفەر رازی دەبن لەکاتێکدا هێشتا گەنجە، ئایا بەپێشەوایەتی ئەو رازی دەبن و لەگەڵ ئەودا رێ ورەسمی حەج ئەنجام دەدەن و بەفەرمانی ئەو بەشداری جەنگەکان دەکەن؟ هادی وتی: گومان ناکەم. یەحیا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا ئێمە لەئەماندا دەبین ئەگەر گەورەکانی وەك فلانە و فیسارە کەس چاوی تەماحی تێ ببڕن و ناشارەزایی ئەو بەدەرفەت بزانن؟ ئایا بەمشێوەیە خەلافەت لەناو ئێوەدا کۆچ ناکات؟ سوێند بەخوا ئەگەر مەهدی ئەم مافەی بۆ براکەت دانەدەنا، تۆ دەبوا ئەو کارە بکەیت و هیچ کات نابێت ئەو گرێی مەهدی بۆ هارونی بەستووە، بیکەیتەوە. بەباشی دەزانم براکەت وەك جێگری خۆت بهێڵیتەوە تا ئەو کاتەی جەعفەر گەورە دەبێت و گەشە دەکات، دواتر ڕەشید بانگ بکە و ئەو لەسەر کار لابە وبۆ جەعفەر بەیعەت وەربگرە. هادی بەوتەکانی رازی بوو، وتی: یەحیا ئەوەی بیرهێنامەوە کە لەبیرم کردبوو. ئازادی کرد.

دووبارە ئەو دەستەیە خراپە وتن لەڕەشیدیان دەست پێکردەوە. هادی ڕەشیدی بانگ کرد و بارودۆخی لێ دژوار کرد. یەحیا بەڕەشیدی وت: مۆڵەتی راو وەربگرە و کاتێك بەمەبەستی راو ڕۆشتیتەدەر، دوور کەوەرەوە و ڕۆژەکان بەسەر ببە. ڕەشید داوای مۆڵەتی ڕاوی کرد و لەدەست هادی رزگاری بوو. روی کردە

کۆشکی منداڵەکانی موقاتیل و بۆ ماوەی چل ڕۆژ لەوێ مایەوە. هادی ئەم کارەی بەناپەسەند زانی و لەنەبوونی ترسا و فەرمانی گەڕانەوەی بۆ نووسی. بەڵام ڕەشید گرنگی بەفەرمانەکە نەدا. هادی سەرکۆنە کردنی ئەوی دەست پێکرد. موالی و سەربازەکانیش زمانیان بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو کردەوە و کاتێك ئەم بابەتە درێژەی کێشا، ڕەشید لەرێگەوە گەیشت.

هادی ڕۆژێك لەسەرەتاکانی خەلافەتی خۆی، لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو، دەستەیەك لەفەرماندەکان و ڕەشید لەخوار تەختەکە دانیشتبوون. هادی سەیری ئەوانی دەکرد. بەهارونی وت: هارون! پێم وابێت گومان دەکەیت خەوەکەت بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت دێتەدی بەڵام بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت چەندین هەڵدێر و گەردەنەی دژوار لەبەردەمتایە.

هارون وتی: ئەی موسا! ئەگەر لەخۆبایی بیت، هیچ بەهایەکت نییە و ئەگەر خاکی بیت، بەهایەکی هەمیشەیی بۆ خۆت دەهێڵێتەوە. ئەگەر ڕێگەی ستەمکاری بگریتەبەر، لەناو دەچیت و ئەگەر دادپەروەری بکەیتە پیشە، ستەم لەناو دەبەیت. هیوادرام لەسەر ئەو تەختە دانیشم و دادی ستەمی تۆ وەربگرم و ئەوەی تۆ پچڕاندووتە، پەیوەندی بدەم و منداڵەکانت پێش منداڵەکانی خۆم بخەم و کچەکانی خۆم بکەمە هاوسەری ئەوان و خواستەکانی باوکم بێنمەدی.

هادی پێی وت: چاوەڕوانیم لەتۆ ئەوە بوو ئەی باوکی جەعفەر. وەرە پێش. هارون نزیك کەوتەوە و دەستی ماچ کرد. ویستی بۆ جێگەکەی خۆی بگەڕێتەوە کەهادی وتی: سوێند بەو کەسە ڕێزدار و فەرمانڕەوا گەورەیە (یانی مەنسور) دەبێت لای من دانیشیت. ئەوی لەسەرەوەی خۆی دانیشاند و فەرمانی دا هەزار هەزار دیناری پێ ببەخشن و نیوەی خەراج بەو بسپێرن.

هادی بەئیبراهیمی حەرانی وت: بیبە بۆ گەنجینە و ئەوەی لەسامانی ئێمە یا نفرین کراوەکان (منداڵەکانی ئومەییە) لەوێ ماوەتەوە، پێی ببەخشە.

پرسیاری خەوەکەیان لەهارون ڕەشید کرد. وتی: مەهدی دەیوت: لەخەودا بینیم دوو داردەستم بەموسا و هاروندا. داردەستەکەی موسا لەسەرەوە گەڵای کرد و داردەستەکەی هارون بەگەڵا داپۆشرا. خەوەکەیان بەم شێوەیە لێکدایەوە کەئەو

دووانە پێکەوە فەرمانڕەوایی دەکەن. ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی موسا کەم دەبێت و هارون زیاتر لەهەر خەلیفەیەك خەلافەت دەکات و ڕۆژگاری باشتر لەهەمووان دەبێت. هەر وایش بوو.

دەگێڕنەوە کەهادی گەیشتە شاری حەدیسەی موسڵ و لەوێ نەخۆش کەوت و گەڕایەوە و بۆ هەموو کارگوزارەکانی خۆی لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا نامەی نووسی تا لەدەروی کۆببنەوە. کاتێك نەخۆشییەکەی تەشەنەی سەند، هەموو ئەو فەرماندانەی کۆکردەوە کەبەیعەتیان لەگەڵ جەعفەر وبۆ کوشتنی یەحیا کوڕی خالید پەیمانیان دابوو. وتیان: ئەگەر خەلافەت بەهارون بگات، هەمووومان دەکوژێت و مەبەستی کوشتنی یەحیایان کرد بەڵام بەخۆیان وت: ئەگەر هادی بێتە هۆش، چ پاساوێك بێنینەوە؟ بەمشێوەیە لەبڕیارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە. کاتێك نەخۆشییەکەی هادی قورس بوو، خەیزەران پەیکی بەدوای یەحیا نارد و داوای لێکرد ئامادە بێت. یەحیا نامە نووسەکانی کۆکردەوە و لەزمانی ڕەشیدەوە کارگوزارەکانی لەمەرگی هادی ئاگادار کردەوە. ڕەشید هەموویانی لەپێگە و جێگەی خۆیاندا هێشتەوە و کاتێك هادی مرد، نامەکان ڕەوانە کران.

دەڵێن: یەحیا زیندانی بوو. هادی مەبەستی ئەوەی کرد هەمان شەو بیکوژێت و ئەوە هەرسیمە کوڕی ئەعیەن بوو ڕەشیدی لەسەر کورسی خەلافەت دانیشاند.

کاتێك هادی مرد، خەیزەران وتی: بیستبوومان لەم شەوەدا خەلیفەیەك دەمرێت و خەلیفەیەك دێتە سەر تەخت و خەلیفەیەك جیهان دەبینێت ( لەدایك دەبێت) هادی مرد، ڕەشید خەلافەتی برد و مەئمون یەکەم شیری لەمەمکی دایکی خوارد. خەیزەران زانستی خۆی لەئەوزاعی (فەقیهی گەورە) فێر ببوو. مەرگی هادی لەعیسا ئاباد ڕوویدا.

## مەرگی هادی

لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع الاول/ ئوت موسای هادی کوڕی محەممەدی مەهدی کوڕی عەبدوالله کوڕی مەنسور کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس کۆچی دوایی کرد.

سەبارەت بەچۆنیەتی مەرگی ئەو گێڕانەوەکان جیاوازن. دەڵێن: برینێك لەسکی پەیدا بوو، هەروەها دەڵێن: نەخۆشییەکی کوشندە لەشاری حەدیسەی موسڵ بەرۆکی گرت و بەهەمان نەخۆشیی مرد. بەخواستی خوا ئاماژەی پێ دەدەین.

دەڵێن: مەرگی ئەو لەسەر دەستی ئەو کەنیزانە روویدا کەخەیزەرانی دایکی فەرمانی پێدابوون. چوونکە لەکاتی خەلافەتی هادی، دایکی دەستی لەکاروباری خەلافەت وەردەدا بەهەمان شێوە کە لەسەردەمی مەهدی ئەو کارەی دەکرد تا ئەوەی چوار مانگ تێپەڕی و خەڵکان هێرشیان کردە سەر کۆشکەکەی. کاروانە جۆراوجۆرەکان هاتوچۆی کۆشکی خەیزەرانیان دەکرد و لەمەبەست و نیازەکانی خۆیان ئاگاداریان دەکردەوە. رۆژێك خەیزەران داوای کارێکی لەهادی کرد کەئەنجام دانی ئەگەری نەبوو. خەیزەران وتی: بەناچار دەبێت داواکارییەکەی من بێنیتەدی چوونکە بەڵێنی ئەنجامدانیم بە عەبدوالله کوڕی مالیك داوە. هادی توڕە بوو و وتی: هاوار لەمن لەدەست ئەو دایك خراپە، دەمزانی نیازێکی لەمشێوە دێنێتە ئاراوە. سوێند بەخوا مەبەستەکەی ئەو ناهێنمەدی. خەیزەران وتی: سوێند بەخوا چیتر داوای هیچ شتێك لەتۆ ناکەم. هادی وتی: زۆر باشە! خەیزەرانی توڕە مەبەستی گەڕانەوەی کرد کەهادی پێی وت: بمێنەرەوە، سوێند بەخوا ئەگەر ئاگادار ببمەوە یەکێك لەفەرماندەکان یا کەسانی نزیکی من بۆ ئەنجامی کارێك یا بەراوەردە کردنی نیازێك بێتە لای تۆ، لەخزمایەتی پێغەمبەر (د.خ) بەدوور بم ئەگەر نەیکوژم و دەست بەسەر سامانەکەیدا نەگرم. ئەم هاتوچۆیانە چییە رۆژانە لەبەردەم ماڵەکەی تۆدا دەبینرێت؟ ئایا تەشیت نییە خۆتی پێوە سەرقاڵ بکەیت یا ناتوانی قورئان بخوێنیتەوە یا ژوورێکت نییە تۆ لەباوەش بگرێت؟ خۆت بەدوور بگرە لەوەی دەرگای ماڵەکەت بۆ موسوڵمان یا ناموسوڵمانێك بکەیتەوە. خەیزەران سەرسوڕماو هەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، رۆشت.

دواتر هادی بەهاوەڵانی خۆی وت: کاممان لەپێشین، من یا ئێوە، دایکی من لەپێشتر یا دایکی ئێوە؟ وتیان: تۆ و دایکت لەپێشترن؟ هادی وتی: کام یەك لەئێوە حەز دەکات ناوی دایکی ببێتە وێردی سەرزمانی خەڵکان و بڵێن دایکی

فلأن، ئەمە و ئەوەی کرد؟ وتیان: کەسمان ئەوە پەسەند ناکەین. هادی وتی: کەواتە بۆ دەڕۆنە بەردەم ماڵی دایکم و باسی وتەکانی ئەو دەکەن؟ کاتێك ئەمەیان بیست، چیتر گفتوگۆ کردن لەگەڵ خەیزەرانیان پشتگوێ خست.

ڕۆژێك هادی برنجی بۆ خەیزەران نارد و وتی: ئەم خواردنەم بەلاوە خۆش بوو، حەزم کرد تۆیش لێی بخۆیت. کەسانی نزیکی خەیزەران وتیان: کەمێك چاوەڕوان بە. سەگێکیان هێنا و خواردنەکەیان خستە بەردەم و سەگەکە دەست بەجێ تۆپی. هادی کەسی بۆ لای خەیزەران نارد و وتی: تامی برنجەکە چۆن بوو؟ دایکی وتی: زۆر باش. هادی وتی: تۆ لێت نەخوارد چوونکە ئەگەر دەتخوارد دەمتوانی بەئاسوودەی ژیان بەسەر ببەم. بەڵام کام خەلیفە هەبە بەبوونی دایکی بتوانێت هەست بەبەختەوەری بکات.

هەروەها دەڵێن: چۆنیەتی مەرگی ئەو بەمشێوە بوو: هادی بۆ لەسەر کار لابردنی ڕەشید لەجێگری خەلیفە و وەرگرتنی بەیعەت بۆ جەعفەری کوڕی، هەوڵەکانی خۆی خستەگەڕ.، خەیزەران بۆ گیانی ڕەشید ترسا و کاتێك هادی نەخۆش کەوت کەنیزەکانی خۆی ڕاسپارد و ئەوانیش پشتیان خستە سەردەمی و ئەوەندەیان زەخت لێکرد تا گیانیدا. بەمشێوەیە خەیزەران کەسێکی بەدوای یەحیا کوڕی خالید نارد و ئەوی لەمەرگی هادی ئاگادار کردەوە.

## مەرگ، ژیان، سرشت و مناڵەکانی هادی

مەرگی هادی لەشەوی هەینی نیوەی ڕەبیع الاول/١٣ سێپتامبەر یا چواردەی ڕەبیع الاول/١٢ سێپتامبەر یا شانزەی ئەم مانگە/١٤ سێپتامبەر ڕوویدا. ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو یەك ساڵ و سێ مانگ یا چواردەمانگ بوو. تەمەنی ئەو لەکاتی مەرگ بیست و شەش ساڵ یا بیست و سێ ساڵ بوو. ڕەشید نوێژی لەسەر خوێند.

نازناوی ئەو باوکی محەممەد و دایکی خەیزەران، دایکی مناڵ بوو. ئەو لەعیسا ئابادی گەورە، لەناو باخەکەی بەخاك سپێردرا. بالا بەرز و ئێسك پان بوو. ڕەنگی پێستی سپی و کەمێك سوورباو بوو. لێوی سەرەوەی کەمێك بۆ لای لووتی بەرز

بیوویەوە.

مەهدی خزمەتکارێکی بۆ دانابوو کەبەردەوام پێی دەوت: موسا، لێو بخە سەریەك. تا هەر دوو لێوی بکەوێتە سەر یەك و لەبەر ئەمە نازناوی (موسا لێو بخە سەریەك)ی بەسەردا برا.

نۆ منالی بۆ هاتە دنیا، حەوت کوڕ و دوو کچ. کوڕەکانی ئەو یەکیان جەعفەر بوو کەهادی دەیوست بەیعەتی بۆ وەربگرێت، ئەوانیتر، عەباس، ئیسحاق، ئیسماعیل و سلێمان و موسا کوڕی موسا کەکوێر بوو. دایکی هەموویان دایکی منالْ بوو. دوو کچەکەی ئەو یەکیان دایکی عیسا بوو کەدواتر بوو بەهاوسەری مەئمون و ئەوی دیکەیان دایکی عەباسە کەنازناوەکەی (نونە)یە.

## بەشێك لەتایبەتمەندییەکانی هادی

هادی لەدادخوازی خەڵکان بۆ ماوەی سێ رۆژ دەستی هەڵگرت. حەرانی پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵکان بەم کردەوەی تۆ رازی نابن. هادی بەعەلی کوڕی سالْحی وت: مۆڵەتی هاتن بەخەڵکان بدە تا (جفلی) بینە لای من نەك (نقری). عەلی کوڕی سالْح ڕۆشتەدەر بێ ئەوەی لەم وتەیە تێگەشتبێت. حەزی نەدەکرد بگەڕێتەوە و سەبارەت بەم وتەیە بپرسێت. عەرەبێکی بیابان نشینی بینی و ئەم پرسیارەی لێکرد. لەوەڵامدا وتی: جفلی یانی ئەوەی مۆڵەت بەخەڵکان بدە دەستە دەستە بێن. ئەو مۆڵەتی بەهەموو خەڵکاندا و خەڵکان تا دووایین کەس ڕۆشتنە ژوور. هادی تا شەو لێکۆڵینەوەی لەسکالاکانی ئەوان کرد. کاتێك بارەگاکەی چۆلْ بوو، عەلی کوڕی سالْح لەوەی روویدا بوو، هادی ئاگادار کردەوە و داوای لێکرد پاداشت بەو عەرەبە بیابان نشینە ببەخشێت. هادی فەرمانیدا سەد هەزار درەمی پێ ببەخشن. عەلی کوڕی سالْح وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوە عەرەبێکی بیابان نشینە و دە هەزار درەمی بەسە. هادی وتی: ئەی عەلی، من دەبەخشم و تۆ رژدی دەبەیت.

دەگێڕنەوە: رۆژێك هادی بەمەبەستی سەردانی دایکە نەخۆشەکەی کۆشکی بەجێهێشت. عومەر کوڕی رەبیع پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا

ڕێگەیەکی باشتر لەمەت نیشان بدەم؟ فریای خەڵکان بکەوە. هادی بۆ دامەزراوەی داد گەڕایەوە و دادی خەڵکانی وەرگرت. کەسی بۆ لای دایکی نارد تا لەباروردۆخی ئاگادار ببێتەوە.

دەگێڕنەوە: عەبدوالله کوڕی مالك فەرماندەی پاسەوانەکانی مەهدی بوو. دەڵێت: مەهدی فەرمانی پێدام قامچی لەشەو نشینەکان و گۆرانیبێژەکانی هادی بدەم و زیندانیان بکەم تا دەستی هادی بەوان نەگات. ئەو کارەم کرد. هادی کەسی بەدوای مندا نارد تا سزای ئەوان کەم بکەمەوە بەڵام ئەو کارەم نەکرد. کاتێك هادی خەلافەتی گرتەدەست، لەکوژرانی خۆم دڵنیا بووم. ڕۆژێك منی بانگ کرد. کفن پۆش ڕۆشتمە بارەگاکەی. هادی لەسەر تەخت دانیشتبوو، شمشێری دەرکێشابوو، سفرەی مەرگی ڕاخستبوو. سڵاوم بۆ نارد. لەوەڵامدا وتی: سڵاوت لێ نەبێت. بیرتە ئەو ڕۆژەی کەسم بۆ لای تۆ نارد تا قامچی لە حەرانی نەدەیت و گرنگیت بەداواکەی من نەدا. ئایا فڵانە کەس و فیسارە کەست لەبیرە – ئاماژەی بەشەونشیینەکانی خۆی کرد– فەرمانەکەی منت پشتگوێ خست. وتم: بەڵێ، لەبیرمە. ئایا دەتوانم هۆکارەکەی باس بکەم؟ وتی: بەڵێ، مۆڵەتت هەیە. وتم: سوێندت دەدەم بەخوا چۆن دەبێت ئەگەر ئەو پێگەم پێببەخشیت کەباوکت پێی بەخشیم و فەرمانی ئەنجامدانی کارێکم پێ بدەیت، ئەوسا یەکێك لەمناڵەکانت فەرمانێك بەمن بدات و من فەرمانەکەی ئەو جێبەجێ بکەم و فەرمانەکەی تۆ پشتگوێ بخەم. هادی وتی: ئەو کارە پەسەند ناکەم. وتم: هەنووکە چۆن ئەوکات گوێڕایەڵی فەرمانەکانی باوکت بووم، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆم. هادی منی لەخۆی نزیك کردەوە، دەستیم ماچ کرد، دیاری پێ بەخشیم و وتی: ئەو کارەت پێ دەسپێرم کەباوکم پێی سپاردی. خواوەند هاوڕێی تۆ بێت. بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە و سەبارەت بەکارەکانی خۆم ئەندێشەم دەکرد، بەخۆمم وت: گەنجە، هەندێ کات مەی دەخواتەوە و ئەو کەسانەی ئازارم پێ گەیاندوون، هاونشینی شەوانەی ئەون یا وەزیرن یا دەبیر، ئەگەری هەیە لەکاتی مەستی بۆچوونەکەی بگۆڕن.

عەبدوالله دەڵێت: دانیشتبووم، کچەکەم لەپاڵمدا ڕاکشابوو. نانم لەت لەت دەکرد و دەمکردە ناو ئاوگۆشتەکەی، تیکەم دەخستە ناو دەمی کچەکەم و خۆیشم

دەمخوارد لەناکاو سمی پێی چوارپێکان زەوی لەراندەوە، گومانم کرد بوومەلەرزەیە. وتم: ئەوە روویدا کەلێی دەترسام.

لەناکاو دەرگا کرایەوە و سوارەکان هاتنە ژوور. هادی لەنێوان ئەوان لەسەر ئەسپەکەی خۆی دانیشتبوو. کاتێك بینیم، بەرز بوومەوە و دەست و پێیم ماچ کرد. هادی وتی: ئەی عەبدوالله! لێکۆڵینەوەم لەکارەکەی تۆکرد. بەخۆم وت ئەگەری هەیە گومان بکەیت مەی خۆرەکان دەوری منیان گرتووە و ئەگەری هەیە لەکاتی مەستی بۆچوونم سەبارەت بەتۆ بگۆڕن، هاتووم دڵت ئاسوودە بکەم و دڵنیات بکەم لەوەی هیچ کینەییەکم لەدڵدا نییە. هەنووکە لەو خواردنەی دەیخۆیت، بیهێنە تا نمەکیماڵەکەت بکەم و چیتر ئاسوودە بە. ئاوگۆشتم خستە بەردەمی، لێی خوارد و ئەوسا وتی: دیارییەکانی من بۆ عەبدوالله بێنن. لەم کاتەدا چوارسەد ئێستر کەباریان درەم و شتی دیکە بوو، هێنایان. هادی وتی: ئەمە هەمووی بۆ تۆیە. لەم سامانە بۆ کارەکەت کەڵك وەربگرە و ئێسترەکان بۆ من بگەڕێنەرەوە چوونکە بۆ هەندێ سەفەر پێویستم پێیانە. ئەمەی وت و گەڕایەوە.

دەگێڕنەوە: یەعقوب کوڕی داود دەڵێت: هیچ عەرەب و ناعەرەبێك، ماق هاوشێوەی عیسا کوڕی ماهانی لەئەستۆی مندا نییە. رۆژێك لەزیندان هاتە لام و وتی: سەروەری باوەڕداران، هادی فەرمانی بەمن داوە سەد قامچی لەتۆ بدەم. قامچییەکەی بەهێواشی بەسەر پشتی مندا هێنا و سەد جار ئەو کارەی دووبارە کردەوە و دواتر ڕۆشت. هادی لێی پرسی: چیت لێکرد؟ وتی: فەرمانەکەی سەروەری باوەڕدارانم جێبەجێ کرد، ئەوەندم لێدا تا گیانی بۆ پەروەردگار بگەڕێتەوە. هادی وتی: ئێمە لەخواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. سوێند بەخوا لەناو خەڵکان منت ریسوا کرد، چیتر لەمەدوا دەڵێن: هادی ئەو خەلیفەیە خوێنی یەعقوب کوڕی داودی ڕشت. عیسا کاتێك بێ ئۆقرەیی هادی بینی، وتی: سوێند بەخوا ئەو زیندووە. هادی وتی: سپاس بۆ خوا.

دەگێڕنەوە: ئیبراهیم کوڕی سەلم کوڕی قوتەیبە، لای هادی پێگەیەکی بەرزی هەبوو. مناڵەکەی ئیبراهیم مرد. هادی بۆ پرسە ڕۆشتە لای و پێی وت: ئەی ئیبراهیم! ئەوەی تۆی شادمان کردبوو، ئەگەری هەیە دوژمن بێت و ئاژاوە، و

ئەوەی تۆی خەمبار کردووە ئەگەری هەیە چاکە بێت. ئیبراهیم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هیچ ئەندامێکم نەما خەمی تیا نەبێت مەگەر ئەوەی بەخۆڕاگری لێپاولیپ کرا. کاتێك ئیبراهیم مرد، ئەم پێگەیە بەسەعید کوڕی سەلەم گەیشت.

دەگێڕنەوە: عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەنازناوەکەی جەززییە، لەگەڵ روقیە کچی عەمرۆ عوسمانییە پەیوەندی هاوسەر گیری بەست. روقیە پێشتر هاوسەری مەهدی بوو. ئەم هەواڵە بەهادی گەیشت. هادی کەسی بۆ لای عەلی کوڕی حسەین نارد و ئەو ڕۆشتە لای. هادی پێی وت: هیچ هاوسەرێکت دەست نەکەوت جگە لەهاوسەری سەروەری باوەڕداران؟ عەلی کوڕی حسەین وتی: خواوەند تەنیا هاوسەرگیری لەگەڵ ژنەکانی باوەگەورێم، پێغەمبەر (د.خ)، بەناڕەوا دادەنێت و ژنانی دیکە بێ هیچ منەتێك بۆ ئێمە ڕەوان. هادی بەداردەستەکەی خۆی کێشای بەسەریدا، سەری شکا و دواتر پێنسەد قامچی لێدا. هادی دەیویست ئەو دەست لەروقیە بەربدات بەڵام عەلی کوڕی حسەین ئەو کارەی نەدەکرد. بەهۆی ئازاری قامچییەکان نیوە گیان بوو. لەیەکێك لەپەنجەکانی ئەنگوستیلەیەکی گرانبایی دەبینرا. یەکێك لەکۆیلەکانی مەبەستی فڕاندنی ئەنگوستیلەکەی کرد، کاتێك ویستی دەریبێنێت، عەلی کوڕی حسەین دەستی کرد و لێیدا. کۆیلە هاواری کرد و هادی هات و دەستی خزمەتکارەکەی بینی، توڕە بوو و وتی: لەگەڵ ئەوەی باوکمت ریسوا کرد و بەوشێوەیە لەگەڵ من ئاخاوتیت، ئەو بەڵایەت بەسەر کۆیلەکەم هێناوە؟ عەلی کوڕی حسەین وتی: لەخۆی بپرسە. هادی کۆیلەکەی سوێنددا تا راستی بێنێتە سەرزمان. کۆیلە راستییەکەی باس کرد. هادی وتی: شایەتی دەدەم ئەو کوڕە مامی منە. ئەگەر ئەو کارەی نەدەکرد پەیوەندی خزمایەتی خۆم لەگەڵ ئەو دەپچڕاند. فەرمانی ئازاد کردنی ئەویدا.

دەگێڕنەوە: رۆژێك کەسێکی زەندیقییان هێنایە لای مەهدی، مەهدی ئەوی کوشت و چوارمێخەی کێشاو دواتر بەهادی وت: هەرکات لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشتیت، دژی ئەم کەسانە شمشێر لەکالان دەرکێشە

(شوێنکەوتەکانی مانی) چوونکە ئەمانە بەشێوەیەکی ئاشکرا خەڵکان بۆ کارە قێزەونەکان و پشت کردنە ژیان و هەوڵدان بۆ ئەو دنیا فریو دەدەن و دوای ئەوە رێگەی گۆشت خواردن و خۆدوور خستنەوە لەدەست کردنە ناو ئاوی پاك و دووری لەکوشتنی دەعبا ئازاردەرەکان و بەدوای ئەم کارانە بۆ پەرەستنی دوو خوایی یانی رووناکی و تاریکی و رەوا زانینی نزیکی لەگەڵ خوشك و کچ و شۆردن بەگمیز و فڕاندنی منداڵەکان لەهەر کۆڵان و گەڕەکێك بۆ رزگار کردن لەتاریکی و بردنیان بەرەو رووناکی، هان دەدەن. بۆ ئەوان پەتی سێدارە ئامادە بکە و شمشێر دەربێنە و بەکوشتنی ئەوان خۆت لەخواوەند نزیك بکەرەوە. من، باوەگەورێی خۆم – عەباس– لەخەودا بینی، شمشێرێکی دایە دەستم تا خوێنی ئەو کەسانە برێژم کەدوو خواوەند دەپەرەستن.

کاتێك هادی هاتە سەرکار، وتی: ئەم دەستەیە لەناو دەبەم، فەرمانیدا هەزار پەتی سێدارە هەڵبدەن بەڵام دوو مانگ دووای ئەم وتەیە، مرد.

دەگێڕنەوە: عیسا کوڕی داب، شارەزاترینی خەڵکی حیجاز لەئەدەبدا بوو. لای هادی پێگەیەکی بەرزی پێبڕا کەپێشتر کەس ئەو پێگەی پێنەبڕابوو. بەردەوام لەکاتی دانیشتن، هادی فەرمانی دەدا پشتی بۆ بێنن. تەنیا ئەم فەرمانەی بۆ ئەو دەردەکرد. هادی پێی دەوت: بەیانی و ئێواریً بەئامادە بوونی تۆ بەخێرایی بەسەردەچێت، ئەگەر لەبەرچاوم ون بیت، هیچ کات لەدڵم دەرناچیت.

رۆژێك هادی فەرمانیدا سی هەزار دیناری پێبدەن. بۆ بەیانی کوڕی داب، کارگوزارەکەی خۆی بۆ لای پەردەدارەکەی هادی نارد تا دینارەکانی لێوەربگرێت. پەردەدار وتی: ئەم کارە لەئەستۆی مندا نییە. برۆ لای سەرپەرەستی دیوان و خاوەنی مۆر. کارگوزار گەڕایەوە بۆ لای کوڕی داب و ئاگاداری کردەوە. کوڕی داب وتی: وازی لێبێنە. رۆژێك هادی لەشوێن خەوی بەهاری کۆشکی بەغداد وەستابوو. کوڕی دابی لەگەڵ تەنیا یەك کۆیلەدا بینی. بەحەرانی وت: ئایا نابینی قیافەی کوڕی داب، پەرێشانە؟ ئێمە بەخششمان پێدا تا شوێنەوارەکەی ببینین. حەرانی وتی: ئەگەر فەرمان بدەیت، لێکۆڵینەوە لەم کارە دەکەم. هادی وتی: نا، خۆی چەندایەتی و چۆنایەتی خۆی باشتر دەزانێت. هادی رۆشتە لای کوڕی داب

وبۆ تانە لێدان پێی وت: دەبینم جل و بەرگی تازە و پاکت لەبەر کردووە، زستان هاتووە و پێویستت بەجل و بەرگی نوێیە. کوڕی داب وتی: توێشووم کەمی کردووە. هادی وتی: چۆن؟ بەخششمان بەتۆ کرد تا سامان بەدەست بێنیت. کوڕی داب وتی: یەك درەم بەدەستی من نەگەشتووە. هادی سەرپەرەستی گەنجینەی تایبەتی بانگ کرد و فەرمانیدا دەستبەجێ سی هەزار درەمی پێ بدەن.

## خەلافەتی ڕەشید کوڕی مەهدی

لەم ساڵەدا بۆ هارون ڕەشید کوڕی محەممەد کوڕی عەبدواللە کوڕی عەلی کوڕی عەبدواللە کوڕی عەباس، لەو شەوەی هادی مرد، بەیعەتیان وەرگرت. لەتەمەنی بیست و دوو ساڵی لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت. دایکی خەیزەران، دایکی مناڵ، خەڵکی یەمەن و لە(جەرش) بوو. لەکۆتاییەکانی زیحەججەی ساڵی سەد و چل و نۆی کۆچی/ ١٩ مارسی ٧٦٢ زایینی لەرەی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هەروەها وتوویانە لەسەرەتای موحەرەمی ساڵی سەد و چل و نۆی کۆچ/١٦ فەوریەی ٧٦٦ زایینی لەدایك بوو.فەزل کوڕی یەحیای بەرمەکی، حەوت ڕۆژ پێش ئەو چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هارون ڕەشید هەم شیری دایکی کوڕی یەحیای دەخوارد هەم شیری خەیزەران. لەگەڵ فەزل برای شیری بوون.

کاتێك هادی مرد، یەحیا کوڕی خالیدی بەرمەکی- وەك دەستەیەك دەڵێن- لەزینداندا بوو. هادی مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد. هەرسیمە کوڕی ئەعیەن خۆی بەڕەشید گەیاند و ئەوی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشاند. ڕەشید کەسێکی بەدوای یەحیادا نارد و ئەوی ئازاد کرد و کردی بەوەزیری خۆی. فەرمانی پێدا نامە بۆ هەموو شارەکان بنوسێت و لەهەواڵی مەرگی هادی و خەلافەتی خۆی ئاگاداریان بکاتەوە.

دەگێڕنەوە: کاتێك هادی مرد، یەحیا کوڕی خالید ڕۆشتە لای ڕەشید کە لەجێگەدا خەوتبوو، پێی وت: هەستە ئەی سەروەری باوەڕداران. ڕەشید وتی: تاکەی بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت بەمشێوەیە سەرسوڕماوم دەکەیت! ئەگەر ئەم هەواڵە بەهادی بگات، دەبێت چی بکەین؟ یەحیا لەمەرگی هادی ئاگاداری کردەوە

و ئەنگوستیلەکەی بەو سپارد. لەم کاتەدا کەسێك مژدەی بۆ هارون هێنا کەخواوەند کوڕێکی پیٚ بەخشیوە. ئەو، ناوی ئەم کوڕەی نا عەبدوالله کەهەمان مەئمونە. جل و بەرگی لەبەر کرد و ڕۆشتە لای جەنازەکەی هادی و لەعیسا ئاباد نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند. ئەو، لەهەمان کات باوکی عیسمەتی کوشت و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

هۆکاری کوشتنی باوکی عیسمەت ئەمە بوو: ڕۆژێك ئەو و جەعفەر ڕێگەیان دەبڕی و گەیشتنە پردێك لەپردەکانی عیسا ئاباد. باوکی عیسمەت بەڕەشیدی وت: لەشوێنی خۆت بێستە تا جێگری خەلیفە بپەڕێتەوە. ڕەشید وتی: فەرمان فەرمانی ئەمیرە. وەستا و جەعفەر گوزەری کرد. ئەمە پاڵی بەڕەشیدەوە نا بۆ ئەوەی تۆڵەی لیٚ بستێنێتەوە.

کاتێك ڕەشید گەیشتە بەغداد، لەسەر پردێك وەستا و مەلەوانەکانی بانگ کرد تا بڕۆنە ناو ئاوەکە. وتی: مەهدی ئەنگوستیلەیەکی پیٚ بەخشیم کەسەد هەزار دەژیا و بە(جبل) ناوی دەبرد. پەیکی هادی هات و داوای ئەنگوستیلەکەی لەمن کرد. من کەلێرەدا وەستابووم، خستمە ناو ئاوەکە. مەلەوانەکان ڕۆشتنە ناو ئاوەکە و ئەنگوستیلەکەیان دەرهێنا. ڕەشید شادمان بوو.

کاتێك هادی مرد، خوزەیمە کوڕی خازم لەهەمان شەو هێرشی کردە سەر جەعفەر کوڕی هادی و لەناو جێگە هێنایەدەر و پێی وت: یا خۆت لەسەر کار لادەبەیت یا دەتکوژم. ئەو ڕازی بوو و خۆی لەسەر کار لابرد و ڕۆژی دواتر خوزەیمە ئەوی نیشانی خەڵکاندا و هەمووان بۆ ئەو کارە (خۆ لەسەر کار لابردنی جەعفەر) بوونە شایەت و لەبەیعەتی ئەو ئاسوودە بوون. بەمشێوەیە خوزەیمە پێگەیەکی بەرزی بەدەست هێنا.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەمساڵەدا لەمانگی شەوال/ مارس، ئەمین چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ناویاننا محەممەد. مەئمون لەو گەورەتر بوو. لەم ساڵەدا ڕەشید یەحیا کوڕی خالیدی وەك وەزیر دەستنیشان کرد و پێی وت: کاروباری خەڵکم خستە سەر شانی تۆ. کەواتە

بەباشترین و شیاوترین شێوە، داوەری بکە، هەرکەس دەخوازیت لەسەر کار لایببە و هەرکەس دەخوازی، کاروبارەکانی پیّ بسپێرە. ئەنگوستیلەکەی پیّ سپارد. ئیبراهیمی موسلّی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

الم تر ان الشمس كانت سقيمة　　　فلما ولى هارون اشرق نورها

بيمن امين الله هارون ذى الندى　　　فهارون واليها و يحيا وزيرها

واتاکەی: ئایا نابینی تیشکی هەتاو کەم ببوویەوە و کاتێك هارون فەرمانڕەوایی گرتەدەست، تیشك پرژان دەستی پێکرد. لەپیرۆزی ئەمین هارون بەردەوام دەبەخشێت دەڵێی هارون فەرمانڕەوای هەتاوە و یەحیا وەزیرەکەی.

یەحیا بەرووکار فەرمانی بەخەیزەرانی دایکی ڕەشید دەدا.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی حاتەمی موهەلیبی، فەرمانداری ئەفریقییە کۆچی دووای کرد و کوڕەکەی خۆی، داودی وەك جێگر دانا. کێونشینەکانی باجە، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ئەبازییە بەهەمان شێوە. داود سوپایەکی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد بەڵام ئەبازییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و سوپاکەی داودیان تێکشکاند. داود سوپایەکی دیکەی تەیار کرد و ئەم جارە ئەبازییەکان شکستیان خوارد و سوپاکەی داود شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشتار کرد. داود وەك فەرماندار مایەوە تا ڕەشید مامی داود، ڕوەح کوڕی حاتەمی موهەلبی وەك فەرمانداری ئەفریقییە دەستنیشان کرد. داود بۆ ماوەی نۆ مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد.

لەم ساڵەدا ڕەشید، عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی لەفەرمانداری مەدینە دوور خستەوە و ئیسحاق کوڕی سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی لەجێگەی ئەو دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا هەرکەس لەعەلەوییەکان کەخۆی شاردبوویەوە، خۆی ئاشکرا کرد. تەبا تەبا عەلەوی یا هەمان ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل و عەلی کوڕی حسەین کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن لەناو ئەواندا دەبینران. دەستەیەك لەزەندیقییەکان لەخۆ حەشاردانی خۆیان بەردەوام بوون. یونس کوڕی فەروە و یەزید کوڕی فەیز لەناو ئەواندا دەبینران.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید هەموو سنوورەکانی جەزیرە و قێنسرینی هەڵگرت و کردی بەیەك سنوور و بە(عواصم) ناوی برد. ڕەشید فەرمانیدا (فەرەج) خزمەتکاری تورك، تەرسوس ئاوەدان بکاتەوە و خەڵکان لەوێ نیشتەجێ بکات.

سەرپەرەستی حاجییەکان لەم ساڵەدا ڕەشید بوو. ئەو درەم و دیناری فراوانی لەناو دوو حەرەمەکدا دابەش کرد.

دەڵێن: ڕەشید لەم ساڵەدا جەنگی هاوینەی ئەنجامدا. دەستەیەکی دیکە دەڵێن: سلێمان کوڕی عەبدوالله بەکائی لەهاویندا جەنگی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی قوسەم فەرمانڕەوای مەککە، موسا کوڕی عیسا فەرمانڕەوای کوفە، محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی فەرمانڕەوای بەسرە، بەحرەین و یەمامە و عومان و ئەهواز و فارس، فەزڵ کوڕی سلێمانی توسی فەرمانڕەوای خوراسان و عەبدولمەلیك فەرمانڕەوای موسڵ بوو.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی، پاشای ئاندۆلۆس بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر بەربەرییەکانی نەفزە و ریسوایی کردن و کوشتارێکی کەم وێنەی لەناو ئەواندا دەستپێکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان فەرمانیدا بناغەی مزگەوتی هەینی قەرتوبە (کوردوبا) دابرێژن. ئەم مزگەوتە لەشوێنێك دروست کرا کەپێشتر کەنیسە بوو. ئەو سەد هەزار دیناری بۆ دروست کردنی ئەم مزگەوتە تەرخان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و یەکی کۆچی ( ٧٨٧ زایینی )

## مەرگی عەبدولرەحمانی ئومەوی پاشای ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی معاویە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك، پاشای ئاندۆلۆس کۆچیی دوایی کرد. مەرگی ئەو لەمانگی رەبیع الاوەلی ئەم ساڵە/ دیسامبەر یا بەوتەیەك لەساڵی سەد و حەفتا و دووی کۆچی/ ٧٨٨ زایینی ڕوویدا. بەلاّم ئەم گومانە ڕاست نییە. ئەو لەدیمەشق یا لەعولیا لەکەنارەکانی تەدمۆر لەساڵی سەد و سیانزەی کۆچ/٧٣١ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەقەرتەبە (کوردۆبا) مرد. عەبدوالللەی کوڕی نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند. عەبدولرەحمان هوشامی کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. هوشام فەرمانڕەوایەتی شاری ماردەی لەژێر دەستا بوو. کوڕە گەورەکەی سلێمان کوڕی عەبدولرەحمان فەرمانداری تەلیتەڵە(تۆلدۆ ) بوو. هیچ کام لەم دوو کوڕە فریای جەستەی بیّ گیانی باوکیان نەکەوتن و تەنیا عەبدوالله ناسراو بە (بەلەنسی) خۆی بەجەنازەی باوکی گەیاند و بۆ هوشامی برای بەیعەتی وەرگرت و هەواڵی مەرگی باوك و فەرمانڕەوایەتی هوشامی بۆ نووسی. هوشام ڕێگەی قەرتەبەی گرتەبەر.

فەرمانڕەوایی عەبدولرەحمان سی و سیّ ساڵ ویەك مانگ درێژەی کێشا. نازناوی ئەو باوکی موتەریف یا باوکی سلێمان یا باوکی زەیدە. یانزە کوڕ و نۆ کچی بۆ هاتە دنیا. هاوسەرەکەی ژنێکی بەربەری لەئەسیرەکانی ئەفریقییە بوو. ئەو سور و سپی، لەڕ، بالاّبەرز، یەك چاو، دوو پرچی درێژ، زمان پاراو، وتاردەر، خۆڕاگر، فرەزان و دووربەندیش بوو و بۆ شوێنکەوتنی نەیارەکانی چالاك وبلەز. بیری لەئاسوودەیی نەدەکردەوە و کەسی بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆی رانەدەسپارد. لەخۆپەسەندی و خۆبەزل زانین خۆی دوور دەخستەوە و تاقولاّیی سوپاکان بوێری و ئازایەتی لەخۆی نیشاندەدا. بەخشەر و جوامێر بوو، بەردەوام جل وبەرگی سپی لەبەر دەکرد. لەدوورئەندێشی و سەختگیر و بەرێوەبردنی ولاّت،

بەهاوتای مەنسوریان دەزانی.

ئەو بناغەی کۆشکی ڕۆسافەی لەقورتەبە داڕشت تا ئەمەکداری خۆی بۆ باوەگەورێی کەروسافەی شامی بنیات نابوو، نیشان بدات. کاتێك ڕۆشتە ناو کۆشکەکە، تاقە دارخورمایەکی بینی و ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان:

تبدت لنا وسط الرصافة نخلة　　　تناءت بارض الغرب عن بلد النخل

فقلت: شبيهى فى التغرب و النوى　　　و طول التنائى عن بنى و عن اهلى

نشأت بارض انت فيها غريبة　　　فمثلك فى الاقصاء و امنتأى مثلى

سقتك الغوادى المزن من صوبها الذى　　　يسح و يستمرى المساكين بالوبل

واتاکەی: لەناو روسافە دارخورمایەکی تاقانە خۆی نیشانی ئێمەدا کە لەکەنارێکی دوور لەکەناری دارخورماکان دوور کەوتۆتەوە. پێمان وت: لەتەنیایی و دوور کەوتەوە و درێژبوونەوەی ماوەی دوور کەوتنەوە لەژن و منالّ، هاوشێوەی منیت. لەزەوییەك بەژنت راست کردەوە کەتیایدا بێگانەیت و کەسێکی هاوشێوەی تۆ لەدوور کەوتنەوە و دوور بوون، هاوشێوەی منە. هەورە پڕ بارانەکان لەهەمان شوێنەوە تۆ تێراو دەکەن کە لەئەستێرەی مەساکین ڕەوان دەبێت.

منالّەکانی ئومەییە لەرۆژهەلاّتەوە مەبەستی ئەویان کرد کە لەناودارترینی ئەوان عەبدولمەلیك کوڕی عومەر کوڕی مەروان، هەمان ئەستێرە درەوشاوەی منالّەکانی ئومەییە بوو کەپشتی کردە منالّەکانی عەباس. پێشتر ئاماژەمان بەم بابەتەدا. یانزە منالّەکەی هاورێیەتیان دەکرد.

## هاتنەسەرکاری هوشام، منالّەکەی عەبدولرەحمان

عەبدولرەحمان هوشامی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردبوو. هوشام، بەتەمەنترین منالّی عەبدولرەحمان نەبوو بەلّکو سلێمان لەو گەورەتر بوو. هوشام نیشانەکانی بوێری و بەرێوەبردنی ولاّتی تیا دەبینرا. لەبەر ئەمە باوکی وەك جێگری خۆی دەستنیشانی کرد.

کاتێك باوکی هوشام مرد، ئەو لەماردە فەرمانڕەوایەتی دەکرد و کاروبارەکانی ئەو ناوچەی هەلّدەسووڕاند. برا گەورەکەی فەرمانڕەوایەتی تۆلّدۆی دەکرد و پێی

وابوو جێگەی باوکی دەگرێتەوە. لەبەر ئەوەی باوکی هوشامی پێش ئەو خستبوو، ڕژدی پێدەبرد و لەناخەوە گوێرایەڵی فەرمانەکانی نەبوو. عەبدوڵلەی برای کەهەمووان ئەویان بە بەلەنسی دەناسی، هاتە کوردوبا بۆ سەر جەنازەی باوك، کاتێك باوکی چاوی خستە سەریەك، بۆ هوشامی برای بەیعەتی وەرگرت و نوێژی لەسەر جەستەی باوکی خوێند. هەواڵی مەرگی باوك و بەیعەتی بۆ هوشام نووسی. هوشام دەستبەجێ ڕێگەی کوردوبای گرتەبەر و لەماوەی شەش ڕۆژ گەشتە ئەو سەرزەمینە و لەسەر تەخت دانیشت. عەبدوڵلە هاتە لای، هەرچەند بەرواڵەت ملکەچی خۆی نیشاندا بەڵام لەناخەوە حەزی بەم کارە نەدەکرد. دواتر بەخواستی خوا ئاماژە بەم بابەتە دەدەین.

## سەحسەحی خارجی

لەم ساڵەدا سەحسەحی خارجی لەجەزیرە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. فەرمانداری جەزیرە، باوکی هورەیرە سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سەحسەح ڕەوانە کرد و سوپاکەی تێکشکاند. ئەو ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و لەباجەرمی ڕووبەڕووی سوپای ئەم شارە بوویەوە و ژمارەیەکی فراوان لەوانی کوشت و بۆ جەزیرە گەڕایەوە و دەستی بەسەر ناوچەکانی ڕەبیعەدا گرت. ڕەشید سوپایەکی ڕازاندەوە و لەدوورین ڕووبەڕوی یەکبوونەوە. سەحسەحیان کوشت. ڕەشید باوکی هورەیرەی لەفەرمانڕەوایی جەزیرە لابرد.

## کوژرانی ڕوەح کوڕی ساڵح

لەمساڵەدا ڕەشید، ڕوەح کوڕی ساڵحی هەمەدانی لەفەرماندەکانی موسڵ، بۆ کۆکردنەوەیماڵیاتی مناڵەکانی تەغلەب دەستنیشان کرد. لەنێوان ئەو و مناڵەکانی تەغلەب ناسازگاری هاتە ئاراوە. ئەو سوپایەکی کۆکردەوە و مەبەستی جەنگی ئەوانی کرد. مناڵەکانی تەغلەب ئاگادار بوونەوە و خۆیان ئامادە کرد و بۆ جەنگی ڕوەح بەڕێکەوتن و بەشێوەیەکی لەناکاو و شەوانە هێرشیان کردە سەر

خۆی و هاوەڵانی و لەناویانبردن. حاتەم کوڕی ساڵح لەسەکیر لەم رووداوە ئاگادار بوویەوە و سوپایەکی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر منالەکانی تەغلەب و لەهێرشێکی لەناکاو ژمارەیەکی زۆر لەوانی کوشت و بەئەندازەی کوژراوەکان ئەسیری گرت.

لەمساڵەدا ڕەشید، عەبدولمەلیك کوڕی ساڵحی هاشمی لەموسڵ لابرد و ئیسحاق کوڕی محەممەدی لەجێگەی ئەودانا.

## دانانی روەح کوڕی حاتەم وەك فەرمانداری ئەفریقییە

لەمساڵەدا ڕەشید، روەح کوڕی حاتەم کوڕی قەبیسە کوڕی موهەلیب کوڕی باوکی سوفرەی وەك فەرمانداری ئەفریقییە دەستنیشان کرد. ڕەشید لەمەرگی براکەی ئاگادار بوویەوە. ڕەشید روەحی لەمانگی رەجەب/مەی ئەم ساڵە بۆ ئەفریقییە ڕەوانە کرد. لەوکاتەدا برازاکەی داود کوڕی یەزید فەرمانڕەوایی ئەفریقییەی دەکرد. بەگەیشتنی روەحی مامی، ئەو بۆ لای ڕەشید گەڕایەوە. رەشید ئەوی وەك فەرمانداری ناوچەیەکی دیکە دەستنیشان کرد.

روەح دەڵێت: کارگوزاری فەلەستین بووم کەڕەشید منی بانگ کرد. کاتێك گەیشتمە بەردەم بارەگای ئەو، لەهەواڵی مەرگی یەزیدی برام ئاگادر ببوویەوە. ڕەشید وتی: هیوادارم خواوەند خەمی لەناوچوونی براکەت بڕەوێنێتەوە، تۆ دەکەمە جێگەکەی ئەو تا ڕێز لەچاکە و کەسەکانی ئەو بگریت.

ڕوەح بەرەو ئەفریقییە بەرێکەوت. ئەم سەرزەمینە لەرۆژگاری ئەو ئارام و دوور لەشۆڕش وئاژاوە بوو چوونکە یەزیدی برای ژمارەیەکی زۆری لەخەواریجییەکان لەناو بردبوو و ئەوانەی مابوونەوە، ئارام و دەستەمۆ ببوون.

روەح لەقەیرەوان مرد و لای گۆڕی براکەی بەخاك سپێردرا. مەرگی ئەو لەرەمەزانی ساڵی سەد و حەفتا و چوار/ ٩ ژوئەنی ٧٩١ زایینی بوو. کاتێك مەنسور، یەزید کوڕی حاتەمی وەك فەرمانڕەوایی ئەفریقییە دەستینشان کرد، فەرمانداری سندی بەروەحی برای بەخشی. بەمەنسوریان وت: ئەی سەروەری باوەڕداران! گۆڕی ئەم دوو برایەت لەیەك دوور خستەوە ( یەکیان لەسند وئەوی

دیکەیان لەئەفریقییە) یەزید لەقەیرەوان مرد و ڕەشید فەرمانڕەوایی ئەفریقییە بەروەح سپارد و ئەویش لەو سەرزەمینە چاوی لەجیهان بەست و لای گۆڕی براکەی بەخاك سپێردرا.

روەح لەرۆژهەلات زەمین زیاتر لەیەزید بەناوبانگ بوو و یەزید لەرۆژئاوا چوونکە مانەوەی ئەو لەو ناوچەیە زیاتر و شەڕی ئەو لەگەڵ ئاژاوەچییەکان دیارتر و بەرچاوتر بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا باوکی عەباس فەزڵ کوڕی سلێمانی توسی لەخوراسان هاتە بەغداد و ڕەشید، جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەسی وەك فەرمانداری خوراسان دیاری کرد. کاتێك جەعفەر ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر، عەباس بەرەو کابول ڕۆشت. لەگەڵ خەڵکانی کابول جەنگا و دەستی بەسەردا گرت. دواتر سانهاری گرت و هەموو سامانەکانی تالأن کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید، باوکی هورەیرە کوڕی فروخ فەرمانداری جەزیرەی کوشت. رەشید باوکی حەنیفە حەرب کوڕی قەیسی بۆ لای باوکی هورەیرە نارد و ئەو باوکی هورەیرەی هێنایە بەغداد و ڕەشید کوشتی.

لەم ساڵەدا ڕەشید فەرمانیدا تالیبییەکان (منالەکانی ئەبو تالیب) لەبەغدادەوە بۆ مەدینەی پێغەمبەر (د.خ) ڕەوانە بکەن جگە لەعەباس کوڕی حەسەن کوڕی عەبدوالله کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی سەعیدی حەروری ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و باوکی خالیدی مەزوری سکی هەڵدڕی.

لەم ساڵەدا روەح کوڕی حاتەم هاتە ئەفریقییە و عەبدسەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس سەرپەرەستی ڕێ ورەسمی حەجی لەئەستۆ گرت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و دووی کۆچی ( ٧٨٨ زایینی )

**چۆنیەتی نافەرمانی کردنی سلێمان و عەبدوڵڵە، کوڕەکانی عەبدولڕەحمان لەفەرمانەکانی براکەی خۆیان، هوشام**

لەم ساڵەدا و یا بەوتەیەکی ڕاستتر لەساڵی سەد و حەفتا و سێی کۆچی /٧٨٩ زایینی، سلێمان و عەبدوڵڵە دوو کوڕەکەی عەبدولڕەحمان کوڕی معاویە کوڕی هوشام، پاشای ئاندۆلۆس، نافەرمانی فەرمانی براکەی خۆیان، هوشامیان کرد. هوشام دوای باوکی لەسەر تەخت دانیشت – وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا – کاتێك هوشام لەسەر تەخت ئارامی گرت، عەبدوڵڵەی برای ناسراو بەبەلەنسی، هاورێیەتی دەکرد و هوشام ڕێزی دەگرت، چاکەی لەگەڵ دەکرد و پێشی دەخست بەڵام عەبدوڵڵە ڕازی نەدەبوو مەگەر بەشەریك بوونی لەفەرمانڕەوایەتی هوشام.

ماوەیەك تێپەڕی و عەبدوڵڵە ترسی هوشامی کەوتە دڵەوە. بۆ لای سلێمانی برای لەتۆڵدۆ هەڵات. کاتێك عەبدوڵڵە لەکورڈوبا ڕۆشت، هوشام دەستەیەکی بەدوای ئەودا نارد تا بیگەڕێیننەوە بەڵام نەیانتوانی بیگرن. هوشام سوپاکەی خۆی ئامادە کرد و ڕێگەی تۆڵدۆی گرتەبەر و گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە. سلێمان هێزێکی زۆری کۆکردەوە. کاتێك هوشام دەوری شارەکەی گرت، سلێمان لەتۆڵدۆ هاتەدەر و کوڕەکەی خۆی و عەبدوڵڵەی بۆ پارێزگاری کردنی شارەکە بەجێهێشت. خۆی ڕێگەی کوردوبای گرتەبەر بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرێت. هوشام لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە بەڵام لەشوێنەکەی خۆی نەجووڵا و لەتۆڵدۆ دوور نەکەوتەوە و لەگەمارۆکەی بەردەوام بوو.

سلێمان بەرێکەوت و گەیشتە شەقوندە (سەکوندا) و ڕۆشتە ناو ئەو سەرزەمینە. لەم کاتەدا خەڵکانی کوردوبا بۆ بەرگری کردن هێرشیان کردەسەر. هوشام کوڕەکەی خۆی عەمید ئەلمولکی لەگەڵ سوپایەك بەدوای سلێماندا نارد. کاتێك لەسلێمان نزیك کەوتەوە، سلێمان هەڵات و ڕووی کردە ماردە. کارگوزاری هوشام لەماردە ڕووبەڕووی بوویەوە و هێزەکانی سلێمانی تێکشکاند. هوشام بۆ ماوەی دوو مانگ و چەند ڕۆژ گەمارۆی خستە سەر تۆڵدۆ و دوای ئەوەی دارەکانی

ئەو ناوچەی لەبنەوە بڕی، ڕووی کردە کوردوبا. لەم کاتەدا عەبدوللەی برای بیّ وەرگرتنی ئەمان هاتە لای. هوشام ڕێزی لەبراکەی خۆی گرت و دڵنەوایی دایەوە.

لەساڵی سەد و حەفتا و چواری کۆچی /٧٩٠ زایینی، هوشام معاویەی کوڕی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ تەدمور ڕەوانە کرد کەسلێمان لەوێ بوو. معاویە لەگەڵی جەنگی و دەوروبەری تەدموری وێران کرد و خەڵکەکەی سەرگەردان و پەرێشان بەرەو دەریا هەڵاتن. سلێمان لەتەدمور هەڵات و پەنای بۆ بەربەرەکانی بەلەنسییە (والێنسیا) برد کەسەرزەمینێکی زیاد لەڕادە دژوار و مەترسیدارە. معاویە بۆ کوردوبا گەڕایەوە.

ئەنجامی کێشەکانی نێوان سلێمان و هوشام بەمە کۆتایی هات کەسلێمان ژن و منداڵ و سامانەکانی خۆی وەرگرتەوە و ئاندۆلۆسی تەسلیم کرد. هوشام لەمیراتی باوکی شەست هەزار دیناری پێدا بەمەبەستی سازان. سلێمان ڕووی کردە سەرزەمینی بەربەرەکان و لەوێ مایەوە.

## چۆنیەتی قووت بوونەوەی دەستەیەك لەبەرابەر هوشام

لەم ساڵەدا سەعید کوڕی حسەین کوڕی یەحیای ئەنساری لەشاغەنت لەکەنارەکانی تەرتوسە (تورتوسا) لەرۆژهەڵاتی ئاندۆلۆس ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. پێشتر باسمان کرد ئەو لەکاتی کوژرانی باوکی پەنای بۆ ئەو سەرزەمینە برد. ئەو خەڵکی بۆ پەیوەست بوون بەیەمانییەکان هان دەدا و پشتیوانی دەکردن. دەستەیەکی فراوان لەدەوری کۆبوونەوە و ئەو دەستی بەسەر شاری تورتوسا گرت و یوسفی قەیسی، کارگوزاری شارەکەی دەرپەڕاند. موسا کوڕی فەرتون لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری کرد و خەڵکی بۆ پەیوەست بوون بەهوشام هان دەدا. موزەرییەکان هاورێیەتیان کرد و شەڕیان لەگەڵ سەعید دەستپێکرد. لەئەنجامدا شکستیان پێهێنا. موسا ڕووی کردە سەرقوستە (ساراگوزا) و دەستی بەسەردا گرت. لەم کاتەدا موالی حسەین کوڕی یەحیا کە بەجەحدەر ناویان دەبرد، لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەبەرابەر ئەو خۆڕاگرییان کرد و موسایان کوشت.

مەترووح کوڕی سلێمان کوڕی یەقزان لەشاری بەرشەلۆنە ئاڵای شۆڕشی بەرز

کردەوە و دەستەیەکی زۆر هاوڕێیەتیان کرد. ئەو شاری ساراگوزا و وەشقەی گرت و دەستی بەسەر پانتاییەکی فراواندا گرت. هێزی فراوان بوو بەتایبەت ئەو کاتەی هوشام سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ دوو براکەی خۆی بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ڕەشید، ئیسحاق کوڕی محەممەدی لەفەرمانداری موسڵ لابرد و سەعید کوڕی سەلمی باهلی لەجێگەی ئەو دانا، هەروەها یەزید کوڕی مەرید کوڕی زائیدە، برازای مەعن کوڕی زائیدەی لەئەرمەنستان لابرد و جێگەی ئەوی بەبراکەی عوبەیدالله کوڕی مەهدیدا.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی سلێمان کوڕی عەلی جەنگی هاوینەی ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ڕەشید بۆ خەڵکانی سواد ( بومییەکانی عێراق) ماڵیاتی دە یەکی ڕێکخست کەدوای وەرگرتنی نیوەی بەرهەمەکانی ئەوان وەریدەگرت.

سەرکردەی حاجییەکان لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی مەنسور بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی ساڵح کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، برای عەبدولمەلیك و سلێمان کوڕی بیلال موالی باوکی عەتیق و باوکی یەزید ڕەباح کوڕی یەزیدی لەخمی مردن.

باوکی یەزید لەقەیرەوان چاوی لەجیهان بەست. دۆعاکانی ئەو بەردەوام وەردەگیرا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتای سێ کۆچی ( ٧٨٩ زایینی )

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی لەبەسرە مرد. ڕەشید کەسی نارد تا میراتی ئەو وەربگرێت. سامان و چوارپێکانی ئەو زیاد لەرادە بوو. ئەوەی لەم سامانە شیاوی دەسەلاَت بوو، ڕەوانەی ڕەشیدیان کرد و شتەکانی دیکەیان پشتگوێ خست.

لەناو ئەو کالاَیانەی وەریان گرت، شەست هەزار هەزار (پارچە قوماش) دەبینرا. کاتێك سامانەکە گەشتە دەستی ڕەشید، زۆربەی لەناو هاونشین و گۆرانیبێژەکاندا بەخشییەوە و پاشماوەکەی بەگەنجینە سپارد.

هۆکاری وەرگرتنی ئەم سامانە لەلایەن ڕەشیدەوە ئەوە بوو جەعفەر کوڕی سلێمان برای محەممەد کوڕی سلێمان لای ڕەشید دژی براکەی خۆی قسەی دەکرد و دەیوت: ئەو ( محەممەد کوڕی سلێمان) هەرچی هەیە، لەسامانی خەڵکان کۆی کردۆتەوە، تا بەمشێوەیە ڕێگە بۆ خۆی تەخت بکات (دەستی بەخەلافەت بگات) و سامانەکانی ئەو شەش دانگی تایبەتە بەسەروەری باوەڕداران.

ڕەشید بەردەوام فەرمانی دەدا کتێبەکانی محەممەد کوڕی سلێمان ڕێزیان لێ بگیرێت. کاتێك ئەو مرد، کتێبەکانی بۆ جەعفەری برای مایەوە. ڕەشید لێی تووڕە بوو، بەلاَم لەبەر ئەوەی محەممەد جگە لەجەعفەر برای دیکەی بوو، ڕەشید ڕازی بوو بەوەی کتێبەکان بۆ ئەو بێت و لەبەرابەردا، سامانەکە بەڕەشید بگات.

لەم ساڵەدا خەیزەران دایکی هارون ڕەشید کۆچی دوایی کرد. ڕەشید جەستەی دایکی لەسەر شان تا گۆڕستانی قوڕەیش برد و لەوێ بەخاکی سپارد. کاتێك ڕێ و ڕەسمی بەخاك سپاردن کۆتایی هات، مۆری لەجەعفەر کوڕی یەحیا کوڕی خالید وەرگرت و بەفەزڵ کوڕی ڕەبیعی سپارد.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید، جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەسی لەفەرمانڕەوایی خوراسان لابرد و کوڕەکەی ئەو عەباس کوڕی جەعفەری لەجێگەی ئەو دانیشاند.

سەرکردەی حاجییەکان لەم ساڵەدا ڕەشید بوو. لەبەغدادەوە ئیحرامی

دەستپێکرد.

لەم ساڵەدا مورگات فەرمانڕەوای جەلیقییە (گالیسیا) لەشارەکانی ئاندۆلۆس، مرد و دوای ئەو بەرمەند کوڕی قەلوریەی قەشە فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست بەڵام دواتر خۆی لەتەختی پاشایەتی دوور خستەوە و ڕێگەی خواپەرەستی گرتەبەر و تەختی پاشایەتی بەبرازاکەی خۆی بەخشی. برازاکەی ئەو لەساڵی ٧٩١/١٧٥ زایینی لەسەر تەخت دانیشت.

لەم ساڵەدا سەلام کوڕی باوکی موتیع و جوەیرییە کوڕی ئەسما کوڕی عوبەیدی بەسری و مەروان کوڕی معاویە کوڕی حارس کوڕی ئەسمای فەزاری (باوکی عەبدوالله ) مردن. مەرگی باوکی عەبدوالله لەمەککە و بەشێوەیەکی لەناکاو بوو.

## ڕووداوەکانیساڵی سەد و حەفتا و چواری کۆچی (٧٩٠ زایینی)

لەم ساڵەدا ڕەشید، ئیسحاق کوڕی سلێمانی وەك فەرمانڕەوای سند و موکران دەستنیشان کرد. یوسف کوڕی باوکی یوسفی وەك دادیار دیاری کرد لەگەڵ ئەوەی باوکی هێشتا لەزینداندا بوو.

لەم ساڵەدا ڕوەح کوڕی حاتەم مرد و ڕەشید ڕووی کردە بنەماڵەی جودی و لەقردا و بازەبدا، لەکەنارەکانی دوورگەی کوڕی عومەر دابەزی و کۆشکێکی بۆ خۆی دروست کرد.

شەڕی هاوینە لەم ساڵەدا لەلایەن عەبدولمەلیك کوڕی ساڵحەوە ئەنجامدرا.

سەرکردەی حاجییەکان لەم ساڵەدا ڕەشید بوو. ڕەشید سامانێکی زۆری لەناو خەڵکاندا بلاْو کردەوە.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی میسهەر لەسەرپەرەستی کردنی دامەزراوەی دادی موسڵ دوور خرایەوە و ئیسماعیل کوڕی زیادی دولابی، جێگەی ئەوی گرتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و پێنجی کۆچی( ٧٩١ زایینی )

لەم ساڵەدا ڕەشید کوڕەکەی محەممەدی بەنازناوی ئەمین وەك جێگر دەستنیشان کرد. لەکاتێکدا تەنیا پێنج بەهار تەمەنی بوو، بەیعەتی بۆ وەرگرت.

هۆکاری بەیعەت وەرگرتن ئەمە بوو: عیسا کوڕی جەعفەر کوڕی مەنسور (خاڵی ئەمین) ڕۆشتە لای فەزڵ کوڕی یەحیا کوڕی خالید و پرسیاری ئەنجامی ئەوی کرد و پێی وت: ئەو کوڕی تۆیە ( فەزڵ برای ڕەشید بوو) و خەلافەتی ئەو دەبێت بۆ تۆ بێت. فەزڵ ئەم مژدەی پێدا و بۆ ئەم کارە هەوڵی دەدا تا ئەوەی خەڵکان بۆ جێنشینی ئەو پەیمانیان بەست.

لەم ساڵەدا ڕەشید، عەباس کوڕی جەعفەری لەفەرمانداری خوراسان دوور خستەوە و خالید کوڕی غێتریفی لەجێگەی ئەو دانا.

عەبدولرەحمان کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی ساڵح لەهاویندا شەڕی کرد و گەیشتە پانتاییەکانی ئەقریتیبە. هەروەها دەڵێن عەبدولمەلیك خۆی جەنگی هاوینەی ئەنجامدا و سەرمای سەخت بەرادەیەك کێشەی بۆ نانەوە کەدەست و پێی ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکان ڕەش بوویەوە.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی عەبدواللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی ڕووی کردە دەیلەم. هارون ڕەشید لەم ساڵەدا سەرپەرەستی حاجییەکانی گرتە ئەستۆ.

## سەرکەوتنی هوشام بەسەر دوو براکەی خۆی و مەتروح

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس، بەسەر دوو براکەی خۆی سلێمان و عەبدواللە سەرکەوت وئەوانی لەئاندۆلۆس دوور خستەوە. کاتێك لەسەرکوت کردنی ئەوان ئاسوودە بوو، هێرشی کردە سەر مەتروح کوڕی سلێمان تا سەرکوتی بکات. سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و فەرماندەیی سوپاکەی بەباوکی عوسمان عوبەیداللە کوڕی عوسمان سپارد. سوپا بۆ سەرکوت کردنی مەتروح بەرێکەوت. مەتروح لەساراگوسا بوو. سوپاکەی

هوشام گەمارۆی خستە سەر شارەکە بەڵام نەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن و باوکی عوسمان گەڕایەوە و لەقەڵای تەرسوونە (تارزونا) جێگیر بوو. ئەم قەڵایە لەساراگوساوە دوور نەبوو. هوشام فەرمانی هێرش کردنە سەر ساراگوسای بەسوپاییەکانیدا و ئەوان شارەکەیان تالان کرد و ڕێگەی گەشتنی دانەوێڵە و خواردەمەنییە پێویستییەکانی شارەکەیان گرت.

ڕۆژێك مەتروح لەکۆتاییەکانی ڕۆژ بەمەبەستی ڕاو هاتەدەر و بازێکی بۆ ڕاوی باڵندەیەك هەڵفڕاند. باڵندەکە گرفتار بوو. مەتروح لەگەڵ دوو هاوڕێکەی مەبەستی سەربڕینی باڵندەکەیان کرد. کاتێك مەتروح لەسوپاکەی دوور کەوتەوە و لەگەڵ ئەو دووانەدا بەتەنیا مایەوە، هێرشیان کردەسەر و سەریان بڕی و سەرە بڕاوەکەیان بردە لای باوکی عوسمان. باوکی عوسمان بۆ هێرش کردنە سەر ساراگوسا سوپاکەی ڕازاندەوە بەڵام خەڵکەکەی نامەیان نووسی و گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆیان نیشاندا. باوکی عوسمان ڕازی بوو و لەساراگوسا دابەزی و سەری مەتروحیان بۆ هوشام نارد.

## جەنگی هوشام لەئاندۆلۆس

کاتێك باوکی عوسمان توانی مەتروح سەرکوت بکات، سوپای هەڵگرت و ڕووی کردە فەرەنگ. ڕێگەی ئولیە و قەڵاکانی گرتەبەر و دوای ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمن، توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت و ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژێت. خواوەند ئەم سەرزەمینەی لەسەر دەستی ئەو گرت.

لەم ساڵەدا هوشام، یوسف کوڕی بەختی وەك پێشەنگی سوپاکەی بۆ جەلالیقە (گالیسیا) ڕەوانە کرد و ئەو ڕووبەڕووی فەرماندەکەیان بەناوی (بۆزرۆگ بەرمەند) بوویەوە. ئاگری شەڕ هەڵگیرسا و گالیسساییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران.

هەروەها لەم ساڵەدا خەڵکی تۆلدۆ ملکەچی خۆیان بۆ هوشام نیشاندا و هوشام ئەمانی پێ بەخشین.

لەم ساڵەدا هوشام بەپێی ئەو هەواڵانەی سەبارەت بەعەبدولمەلیکی کوڕی پێی

دەگەیشت، ئەوی زیندانی کرد و تاکۆتایی ژیانی باوکی لەپانتاییەکانی ژێر دەسەڵاتی باوکی لەزیندان مایەوە و سەرئەنجام لەساڵی ١٩٨/ ٨٠٤ زایینی مرد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا حەسینی خاریجی لەخوراسان ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو لەموالییەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە و خەڵکی ئەوق بوو. فەرمانڕەوای سەجستان، عوسمان کوڕی عومارە سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد بەڵام حەسین شکستی پێ هێنا و دواتر مەبەستی خوراسان، بادغەیس، بوشەنج و هەراتی کرد. ڕەشید بۆ غێتریف نامەی نووسی و داوای سەری حەسینی کرد. غێتریف، داود کوڕی یەزیدی لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەر بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. حەسین لەگەڵ شەشسەد کەس ڕووبەڕوویان بوویەوە و هێزەکانی داودی شکاند و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. دواتر ڕووی کردە خوراسان و لەساڵی ٧٩٣/١٧٧ زایینی کوژرا.

لەم ساڵەدا لەیس کوڕی سەعدی فەقیە لەمیسر و محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم باوکی عەنبەسی شاعیر مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا موسەییب کوڕی زوهەیر کوڕی عومەر کوڕی موسلیمی زەببی- یا بەوتەیەك لەساڵی ٧٩٢/١٧٦ زایینی- سەرکردەی پاسەوانەکانی مەنسور و مەهدی کەمەهدی فەرمانداری خوراسانی پێدا، مرد.

لەم ساڵەدا ئیدریس کوڕی ئیدریس کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و شەشی کۆچی ( ٧٩٢ زایینی )

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن لەدەیلەم دەرکەوت و شکۆ و مەزنی پێبڕا و هێزەکانی فراوان بوون و خەڵکان لەهەموو شارەکانەوە لەدەوری کۆبوونەوە. ڕەشید لەم ڕووداوە خەمبار بوو. فەزڵ کوڕی یەحیای لەگەڵ پەنجا هەزار هێزی شەڕکەر ڕەوانە کرد و فەرمانڕەوایەتی جەرجان وتەبەرستان و ڕەی و ناوچەکانی دیکەی بەوسپارد و سامانێکی زۆری پێدا. فەزڵ کوڕی یەحیا کوڕی عەبدوڵڵە نامەیەکی بۆ نووسی و دڵنەوایی کردەوە و لەدەرئەنجامی کارەکەی ئاگاداری کردەوە و دژوارییەکانی ڕێگەی نیشاندا و هیواداری کرد.

فەزڵ لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەتاڵەقان لەشوێنێك بەناوی ئەشەب دابەزی. بەردەوام نامەی بۆ یەحیا دەنووسی و پەیکی بۆ لای فەرمانڕەوای دەیلەم دەنارد و هەزار هەزار دەرەمی پێبەخشی تا ڕێگەی هاتنە دەرەوەی یەحیا لەدەیلەم فەراهەم بکات. یەحیا بەسازان لەگەڵ هارون ڕازی بوو لەسەر ئەو بنەمایەی فەزڵ بەدەستخەتی خۆی ئەمانی ئەو لەڕەشید وەربگرێت و قازییەکان و فەقیهەکان و زۆرینەی منداڵەکانی هاشم و پیرەکانی ئەوان وەك عەبەسەمەد کوڕی عەلی بەشایەت بگرێت. ڕەشید ڕازی و کارەکەی فەزڵی پەسەند کرد. پێگەی فەزڵ لای هارون بەرز بوویەوە و ئەمان نامەکەی لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی ڕەوانە کرد. یەحیا و فەزڵ هاتنە بەغداد و ڕەشید بەرێز و گەرمییەوە پێشوازی لێکردن و سامانێکی زۆری بەیەحیا بەخشی.

دواتر یەحیای خستە زیندانەوە. یەحیا لەزیندان مرد. ڕەشید ئەمان نامەکەی یەحیا کوڕی محەممەدی نیشانی محەممەد کوڕی حەسەنی فەقیە و باوکی بەختەری قازیدا ( بۆ ئەوەی هۆکارێك بۆ گرتنی یەحیا بدۆزنەوە). محەممەد وتی: ئەمان نامەکە ڕاستە. ڕەشید قسەی لەگەڵ کرد و ئاگاداری کردەوە کەیەحیا ئاژاوەگێڕ بووە و ئەو کاتە ئەمانی پێ بەخشراوە و هەنووکە کاتەکەی بەسەر چووە. لەئێستادا ئەو ئەمان نامەیە هیچ سوودێکی نییە. باوکی بەختەری

بەوتەکەی ڕەشید رازی بوو، وتی: ئەم ئەمان نامەیە بەم پێیە و بەو پێیە هیچ بەهایەکی نییە و ڕەشید دڕاندی.

## فەرمانڕەوایی عومەر کوڕی مەهران لەمیسر

لەم ساڵەدا ڕەشید موسا کوڕی عیسای لەفەرمانڕەوایی میسر دوور خستەوە و جەعفەر کوڕی یەحیا کوڕی خالیدی لەجێگەی ئەو دانا. جەعفەریش بەنوێنەرایەتی خۆی عومەر کوڕی مەهرانی وەك فەرمانڕەوایی ئەو پانتاییە دەستنیشان کرد.

هۆکاری لابردنی موسا کوڕی عیسا ئەوە بوو ڕەشید ئاگادار بوویەوە موسا مەبەستی ڕووخاندنی خەلافەتی ئەوی لەسەردایە. ڕەشید وتی: سوێند بەخوا بەشێوەیەك لەسەر کار لایدەبەم زۆر ریسواتر لەلابردنی کەسانی بەردەم دەرگاکەی خۆی.

جەعفەر فەرمانیدا عومەر کوڕی مەهران بێنێتە دەرگای بارەگاکەی. ئەو پیاوێکی لۆچ، ئەندامێکی نارێك و کۆنەپۆش بوو. ڕەشید پێی وت: وەك فەرمانڕەوایی میسر دیاری کراویت؟ عومەر وتی: لەسەر بنەمای ئەو پەیمانانەی پێیان رازی ببم کەیەکیان ئەوەیە کاتێك کاروبارەکانی ئەو سەرزەمینەم ڕێکخست، لەسەر خواستی خۆم دەگەڕێمەوە. ڕەشید رازی بوو.

کاتێك عومەر گەیشتە میسر، ڕۆشتە ماڵەکەی موسا و لەریزەکانی خوارەوەی خەڵکان شوێنێکی بۆ دانیشتن دیاریکرد. کاتێك هەمووان بڵاوەیان لێکرد، موسا پێی وت: ئایا نیازێکت هەیە.؟ عومەر وتی: بەڵێ، ئەوسا فەرمانەکەی تەسلیم کرد. موسا کاتێك خوێندییەوە، وتی: ئایا باوکی حەفس (نازناوی عومەر) کەخوا تەمەنی درێژ بکات، خۆی دێت؟ عومەر وتی: من باوکی حەفسم. موسا وتی: نفرینی خواوەند لەفیرعەون بێت ئەو کاتەی وتی: ئایا فەرمانڕەوایی میسر تایبەت نییە بەمن. کاروبارەکانی بەعومەر سپارد. عومەر فەرمانی بەدەبیرەکەی خۆیدا پێشکەشی وەرنەگرێت مەگەر ئەوەی دەیخەنە ناو کیسە. لەبەر ئەمە نەچوارپێی لەکەس وەردەگرت، نەکەنیز. تەنیا جل و بەرگ وپارەی وەردەگرت و ناوی

خاوەنەکەی لەسەر کیسە دەنووسی و لەسوچێکدا دایدەنا.

میسرییەکان عادەتیان بوو درەنگ باج بدەن و کەم. عومەر کارەکانی خۆی لەگەڵ پیاوێکی میسری دەستپێکرد و داوای باجی لێکرد. ئەو لەدانی باجەکە کەمتەرخەمی لەخۆی نیشاندا. عومەر سوێندی خوارد باجی لێ وەرنەگرێت مەگەر لەبەغداد. چیتر باجی لێ وەرنەگرت و ئەوی ڕەوانەی بەغداد کرد و لەبەغداد قەرزەکەیان لێ وەرگرت. چیتر کەس بۆ دانی باج کەمتەرخەمی لەخۆی نیشان نەدەدا و دوایان نەدەخست. عومەر بەشی یەکەم و دواتر بەشی دووەمی باجی وەرگرت و کاتێك مەبەستی وەرگرتنی بەشی سێیەمی کرد، گلەیی و گازندەکان لەهەژاری و دەستکورتی دەستی پێکرد. پێشکەشییەکانی هێنایە بەردەست و بەهای ناوەکەی بۆ خاوەنەکانی نووسی و وەك باج لەقەڵەمیدا و ئەوەی مابوویەوە، خستییە ئەستۆی خۆیان. ئەوان بەخێرایی بۆ دانی باج هەوڵیاندا و بەمشێوەیە باجی میسر بێ کەم و کوڕی وەرگیرا. کەس جگە لەو نەیتوانی بوو ئەم کارە بکات. دوای ڕێکخستنی کاروبارەکانی میسر گەڕایەوە بۆ بەغداد.

## ئاژاوەی دیمەشق

لەم ساڵەدا لەنێوان موزێرییەکان و یەمانییەکان لەدیمەشق ئاژاوەیەك کەوتەوە. سەرکردەی موزێرییەکان، باوکی هەیزام بوو کەناوی عامر کوڕی عومارە کوڕی خوزەیمی ناعیم کوڕی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی خاریجە کوڕی سەنان کوڕی باوکی حارسە کوڕی مورە کوڕی نوشبە کوڕی غەیز کوڕی مورە کوڕی عەوف کوڕی سەعد کوڕی زوبیان کوڕی بەغیز کوڕی ڕەیش کوڕی غەتەفانی مورییە. یەکێك لەشاسوارە بەناوبانگەکانی عەرەبەکانە.

هۆکاری ئاژاوەکە ئەمە بوو: کارگوزاری ڕەشید لەسەجستان یەکێك لەبراکانی باوکی هەیزامی کوشت. باوکی هەیزام لەشام ڕاپەڕی و دەستەیەکی فراوانی کۆکردەوە و لەپرسەی براکەیدا وتی:

سأبليك بالبيض الرقاق و بالقنا      فان بها ما يدرك الطالب الوترا

و لسنا كمن ينعى اخاه بغيره      يعصرها من ماء مقلته عصرا

و انا اناس ما تفیض دموعنا          علی هالك منا و ان قصم الظهرا

و لکنی اشفی الفواد بغارة          الهب فی قطری کتائبها جمرا

واتاکەی: بەشمشێری تیژ و ڕم بۆ تۆ دەگریم (دڵۆپی خوێنی لێ دەرژێت) و تۆڵەستێن بەشمشێر ورم تۆڵە دەستێنێت. هاوشێوەی ئەوکەسانە نین هەواڵی مەرگی براکەی خۆیان بەباراندنی فرمیسك بەکەسانی دیکە بدات. خەڵکانێك نین بۆ مردووەکەی خۆیان – هەرچەند جەرگبڕ– فەرمێسك لەچاو ببارێنین. دڵی خۆم بەهێرشێك ئارام دەکەمەوە و ئاگرەکەی داوێنی ئەو سوپایە دەگرێت کە لەناو سەرزەمینەکەی مندان.

دەڵێن: ئەمە هۆنراوەی کەسێکی دیکەیە بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە هۆنراوەی باوکی هەیزامە. ڕەشید فێڵێکی کرد و براکەیتری ئەوی هاندا و ئەو بەشێوەیەکی لەناکاو براکەی خۆی گرت و تەسلیمی ڕەشیدی کرد. دواتر منەتی خستە سەر و ئازادی کرد.

دەڵێن: هۆکاری سەرەکی ئەم ئاژاوەیە لەشام بوو. پیاوێك لەمناڵەکانی قەین بۆ ئارد کردنی گەنم رووی کردە ئاشی بەلقا. لەرێگە لەباخێك گوزەری کرد، باخەکە تایبەت بوو بەپیاوێکی لەخمی یا جوزامی. خەیار و کاڵکی تیا چاندبوو. پیاوی قەینی دەستی دزی بۆ ئەم باخە درێژ کرد و باخەوان جوێنی پیدا و یەخەی یەکیان گرت. پیاوی قەینی ملی ڕێگەی گرتەبەر و ڕۆشت. باخەوان دەستەیەك لەیەمانییەکانی کۆکردەوە تا لەکاتی گەڕانەوەی پیاوی قەینی، ئازاری بدەن. کاتێك پیاوی قەینی گەڕایەوە، بەڕادەیەك لێیاندا کەدەستەیەك بۆ هاوکاری کردنی هاتن و لەم ناوەدا پیاوێکی یەمانی لەخوێنی خۆیدا گەوزا و مرد و کەسەکانی داوای خوێنی ئەویان کرد و بۆ وەرگرتنی تۆڵەی ئەو دەستیان خستە ناو دەستی یەك.

فەرمانڕەوای ئەو ڕۆژگارەی دیمەشق عەبدسەمەد کوڕی عەلی بوو. کاتێك خەڵك لەتێك چوونی پەیوەندییەکان نیگەران بوون، فرەزان و سەرکردەکان کۆبوونەوە تا بارودۆخ ئارام و هێور بکەنەوە. ڕۆشتنە لای مناڵەکانی قەین و گفتوگۆیان لەگەڵ کردن. ئەوانیش وەڵامی فرەزانەکانیان دایەوە. دواتر ڕۆشتنە لای یەمانییەکان و

لەگەڵیان ئاخاوتن. بەمشێوەیە وەڵامیان دایەوە: بگەرێنەوە تا لێکۆڵینەوە لەم کارە بکەین. ئەوان بەدوای ئەم گفتوگۆیە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر مناڵەکانی قەین و شەشسەد کەس لەوانیان کوشت. دەستەیەك ژمارەی کوژراوەکان بەسێسەد کەس دەزانن. مناڵەکانی قەین دەستی هاوکارییان بۆ خەڵکانی قەیس درێژ کرد و ئەوان وەڵامیان دانەوە. ئەوان پێکەوە روویان کردە سەوالیك لەکەنارەکانی بەلقا و هەشسەد کەسیان کوشت و ئاگری جەنگ لەنێوان ئەواندا بڵێسەی سەند.

عەبدسەمەد لەفەرمانداری دیمەشق دوورخرایەوە و ئیبراهیم کوڕی ساڵح کوڕی عەلی جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەم جەنگانە دوو ساڵ درێژەی کێشا. ئەوان لەبەسنییە رووبەرووی یەك بوونەوە و نزیکەی هەشسەد کەس لەیەمانییەکان کوژران و دوای ماوەیەکی زۆر، ئەم جەنگ و بگرە وبێنە بەئاشتی و سازگاری کۆتایی هات.

ئیبراهیم کوڕی ساڵح کەخوازیاری سەرکەوتنی یەمانییەکان بوو، هاتە لای ڕەشید. لای ڕەشید خراپەی خەڵکانی قەیسی هێنایە سەرزمان بەڵام عەبد واحید کوڕی بوشری نەسری لەمناڵەکانی نەسر، ئەوانی بێ تاوان لەقەڵەمدا و ڕەشید بەوتەکانی رازی بوو. هەموویان گەڕانەوە. ئیبراهیم کوڕی ساڵح کوڕەکەی خۆی ئیسحاقی بەنوێنەرایەتی خۆی وەك فەرمانڕەوای دیمەشق دیاری کرد. ئەویش زیاتر لەیەمانییەکان خۆی نزیك دەکردەوە. دەستەیەك لەخەڵکانی قەیسی زیندانی کرد، قامچی لێدان و ریشی ئەوانی تاشی. شۆڕش لەناو خەڵکان سەری هەڵدایەوە و غەسانییەکان هێرشیان کردە سەر پیاوێك لەمناڵەکانی قەیس کوڕی عەبەسی و کوشتیان. براکەی ئەو هاتە لای دەستەیەك لەزەواقیلی حوران و داوای هاوکاری کرد. ئەوانیش هاوکارییان کرد و پیاوێکی یەمانییان کوشت.

یەمانییەکان هێرشیان کردە سەر کولەیب کوڕی عەمرلاۆ کوڕی جونەید کوڕی عەبدولرەحمان و میوانەکەیان کوشت. دایکی کوژراو، جلەکانی ئەوی هەڵگرت و ڕۆشتە لای باوکی هەیزام و لەبەردەم ئەو فڕیدا. باوکی هەیزام بەدایکی کوژراوی وت: بگەرێرەوە تا لێکۆڵینەوە لەم پێشهاتە بکەین. لەمن دوورە پێ بخەمە

شوێنێکی نادیار. با فەرمانڕەوا بێت و داوای خوێنبایی لێ بکەین. ئەگەر وەڵامی دایەوە، بەمەبەستەکەی خۆمان گەشتووین و گەرنە بەرەو بارەگای سەروەری باوەڕداران دەڕۆین.

ماوەیەك دواتر ئیسحاق باوکی هەیزامی بانگ کرد. باوکی هەیزام ڕۆشتە دەرگای بارەگاکەی بەڵام ئیسحاق مۆڵەتی ڕۆشتنە ناوی پێنەدا. دواتر دەستەیەك لەزەواقیل پیاوێکی یەمانییان کوشت و یەمانییەکان پیاوێك لەسولەیمیان کوشت و سامانی خەڵکانی تلفیاسایان تالاَن کرد کەدراوسێی موحاریب بوون.

موحاریب ڕۆشتە لای باوکی هەیزام و هەردووك بۆ لێکۆڵینەوە لەم کارە ڕۆشتنە لای ئیسحاق. ئیسحاق بەڵێنی پێدان و باوکی هەیزام شادمان گەڕایەوە. کاتێك گەڕایەوە، ئیسحاق کەسی بۆ لای یەمانییەکان نارد و ئەوانی دژی باوکی هەیزام هاندا. یەمانییەکان کەسەکانی خۆیان کۆکردەوەو لەلای جابییەوە هێرشیان کردە سەر باوکی هەیزام. باوکی هەیزام لەگەڵ ژمارەیەکی کەم خۆڕاگری کرد و توانی شکستیان پێ بێنێت و دەست بەسەر دیمەشقدا بگرێت و زیندانییەکان ئازاد بکات.

یەمانییەکان هێزیان کۆکردەوە و داوای هاوکارییان لەمناڵەکانی کەلب و کەسانی دیکە کرد و ئەوان وەڵامیان دانەوە. باوکی هەیزام ئاگادار بوویەوە و کەسی بۆ لای موزێرییەکان نارد و موزێرییەکان هاوکارییان کرد. ئەو لەتوما ڕووبەڕووی یەمانییەکان بوویەوە و شکستی پێهێنان.

دواتر یەمانییەکان ڕوویان کردە گوندەکانی قەیس لەنزیك دیمەشق. باوکی هەیزام زەواقیلی بەشوێن ئەواندا ڕەوانە کرد و شەڕیان لەگەڵ کردن و دووبارە توانیان شکستیان پێ بێنن. دەستەیەکی دیکە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپاکەی باوکی هەیزام ڕەوانە کران بەڵام ئەوانیش شکستیان خوارد. دواتر هاواری (فریای دەروازەی توما بکەون) بەرز بوویەوە و دەستەیەکی دیکە لەیەمانییەکان ڕوویان لەگۆڕەپانی جەنگ کرد و دوبارە شکستیان خوارد. بەمشێوەیە یەمانییەکان لەیەك ڕۆژ چوار جار ڕووبەڕووی شکست بوونەوە و هێزەکانی باوکی هەیزام سەرکوتوو گەڕانەوە.

ئیسحاق کەسی بەدوای باوکی هەیزام نارد و داوای کرد دەست لەشەڕ هەڵبگرێت. باوکی هەیزام دەستی هەڵگرت. ئیسحاق پەیامی بۆ یەمانییەکان نارد: من دەبمە ڕێگر لەشەڕی باوکی هەیزام لەگەڵ ئێوە، هەنووکە پیاوێکی هەڵخەڵەتاو لەبەرابەر ئێوەیە. ئەوان بەشمشێری دەرکێشراو لەدەروازەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هێرشیان کرد بەڵام باوکی هەیزام پێشتر ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ شاسوارەکانی خۆی ڕووبەڕوویان بوویەوە و تامی شکستێکی گەورەی پێچێشتن.

باوکی هەیزامیان ئاگادار کردەوە دەستەیەك بۆ هاوکاری یەمانییەکان لەدەروازەی توما کۆبوونەتەوە. باوکی هەیزام هێرشی کردە سەریان و کۆتای بەتۆماری ژیانیان هێنا. یەمانییەکان خەڵکانێك لەئەردەن، خەولان، کەلب و کەسانی دیکەیان کۆکردەوە. باوکی هەیزام ئاگادار بوویەوە و کەسی نارد تا بەوردی لەبارودۆخ ئاگاداری بکاتەوە بەڵام نێردە نەیتوانی هەواڵێکی ڕاست و دروستی بۆ بێنێت. یەمانییەکان مەبەستی ئەوەیان کرد لەشوێنێکەوە هێرش بکەن کەهێزەکانی باوکی هەیزام بەسەنگەر لێدان لێی ئاسوودە بوون.

کاتێك ڕۆژ گەیشتە نیوە و باوکی هەیزام هیچی نەبینی، هاوەڵانی خۆی بڵاوە پێکرد و خۆی گەڕایەوە بۆ ناو شار و دەستەیەکی بۆ پاسەوانی کردن ڕاسپارد. کاتێك ئیسحاق بینی باوکی هەیزام بەئاسوودەی گەڕاوەتەوە بۆ ناو شار، کەسانێکی بۆ لەناو بردنی ئەو قەڵایە نارد و فەرمانی هێرش کردنی بەیەمانییەکاندا. ئەوان هێرشیان کرد. پێشەنگەکانی سوپاکەی باوکی هەیزام بەپەلە لەم پێشهاتە ئاگاداریان کردەوە. لەم کاتەدا نزیك دەروازەی بچوکی شار بوو. یەمانییەکان هاتنە ناو شار و هێرشیان کردە سەر باوکی هەیزام. بێدرەنگ فەرمانی بەهاوەڵانیدا لەپشتەوە هێرش بکەنە سەر یەمانییەکان. ئەو کارەیان کرد. کاتێك یەمانییەکان ئەمەیان بینی، دەنگیان بەرز کردەوە: شوێنی هەڵاتن، شوێنی هەڵاتن، بەم شێوەیە دووبارە تامی تاڵی شکستیان چێشت و کەرەستەکانی جەنگیان لێ بەجێما.

لەسەرەتای مانگی سەفەر /ئاوریل، ئیسحاق سوپاییەکانی خۆی کۆکردەوە ولەکۆشکی حەجاج ئورودوویان لێدا. باوکی هەیزام هاوەڵانی خۆی ئاگادار

کردەوە. منداڵەکانی قەین و کەسانی دیکە هاتن. یەمانییەکان لەناو سوپاکەی ئیسحاقدا کۆبوونەوە. دەستەیەك لەسوپاییەکان جەنگیان ئەزمون کرد و یەمانییەکان شکان و دەستەیەك لەوان لەناو خوێنی خۆیاندا تلان. هاوەڵانی باوکی هەیزام سامانی دەستەیەك لەخەڵکانی (داری)یان تاڵان کرد و ئاگریان تێبەردا و گەڕانەوە. دووبارە دەستیان بۆ تاڵان کردن درێژ کردەوە و سوتاندیان و کوشتیان و چەندین جار شکستیان بەیەمانییەکان هێنا.

کچی زوحاك کوڕی ڕەملی سەکسەکی یەمانی داوای ئەمانی لەباوکی هەیزام کرد و باوکی هەیزام ئەمانی پێ بەخشی و ئەمان نامەیەکی بۆ نووسی. باوکی هەیزام لەگوندە یەمانییەکان لەکەنارەکانی دیمەشق دەستی بەتاڵان و بڕەو کرد و گوندەکانی سووتاند. کاتێك یەمانییەکان بارودۆخیان بەمشێوەیە بینی، کوڕی خارجەی حەرەشی و کوڕی عوزەی حوشنی و هۆزەکانی ئەوزاع و ئەوساب و موقرا و خەڵکانی کەفەرسوسییە و حەمیرییەکانیان بۆ لای باوکی هەیزام ڕەوانە کرد و داوای ئەمانیان کرد. باوکی هەیزام ئەمانی پێ بەخشین و خەڵکان ئاسوودە و ئارام بوون.

باوکی هەیزام بڵاوەی بەهاوەڵانی خۆی کرد و لەگەڵ چەند کەسێك لەدیمەشقییەکان مایەوە. ئیسحاق خیانەتی لەباوکی هەیزام کرد و پارەیەکی فراوانی بەسوپاییەکاندا تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەنە سەر باوکی هەیزام. ئەو، باوکی عوزافێری سەکسەکی لەگەڵ دەستەیەك بۆ کوشتنی باوکی هەیزام ڕەوانە کرد. باوکی هەیزام ڕووبەڕوویان بوویەوە و جەنگی بەشێوەیەك هەڵاتن.

شەڕی نێوان باوکی هەیزام و سوپاییەکان لەنیمەڕۆ تا شەو درێژەی کێشا و سوپاییەکانی باوکی هەیزام هێرشیان کردە سەر سەربازەکانی دییکە و بوێرییان لەخۆیان نیشاندا و لەگەڵ چوارسەد سەربازی بریندار گەڕانەوە بەڵام کەسیان لێ نەکوژرا. ئەم ڕووداوە لە نیوەی مانگی سەفەر/ ژوئەنی زایینی ڕوویدا.

بۆ بەیانی تا ئێواری هیچ شمشێرێك لەکاڵان دەرنەهات. کاتێك ڕۆژ کۆتایی هات، ئیسحاق هاتە ناو سوپاییەکان و شەوی بەجەنگ بەسەر برد. هەر دوو لای شەڕکەر لەناو شاردا بوون. باوکی هەیزام داوای هاوکاری لەهاوەڵانی کرد و ڕۆژی

دواتر ئاگری جەنگ بڵێسەی سەندەوە. ژمارەی شمشێر وەشێنەکانی ئیسحاق دوانزە هەزار کەس بوو. یەمانییەکان هاتن و باوکی هەیزام شارەکەی بەجێهێشت و بەهاوەڵە کەمەکانی خۆی وت: دابەزن. ئەوان دابەزین و لەکەنار دەروازەی جابییە، دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان گوێچکەی ئازار دەدا تا ئەوەی هێزەکانی باوکی هەیزام ناچار پاشەکشێیان کرد.

ماوەیەك دواتر دەستەیەك لەحیمس بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر یەکێك لەگوندەکانی شوێنکەوتەی باوکی هەیزام. باوکی هەیزام دەستەیەك لەهاوەڵانی بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە کرد. سوپاکەی حیمس تێکشکا و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. هێزەکانی باوکی هەیزام گوندە یەمانییەکانیان لەغوتە و هۆزی (داری)یان کردە خۆراکی ئاگر. دواتر بۆ ماوەی حەفتا و چەند ڕۆژ جەنگ وەستا.

لەسەرەتای رەبیع الاول / ژوئەنی ئەم ساڵە، سندی لەگەڵ سوپای ڕەشید گەیشت و یەمانییەکان بۆ لەناو بردنی باوکی هەیزام هانیاندا. باوکی هەیزام کەسی بۆ لای سندی نارد و گوێرایەڵی و ملکەچی خۆی نیشاندا. سندی هاتە ناو دیمەشق. ئیسحاق لەکۆشکی حەجاجدا بوو. بۆ ڕۆژی دواتر سندی فەرماندەیەکی لەگەڵ سێ هەزار سەرباز ڕەوانە کرد و باوکی هەیزام لەگەڵ هەزار کەس ڕووبەڕوویان بوویەوە. کاتێك فەرماندە ئەوی بینی، بۆ لای سندی گەڕایەوە و وتی: لەبەدیهێنانی خواستەکانی ئەم دەستە خۆت بەدوور مەگرە چوونکە خەڵکانێکم بینی زیاتر لەژیان ئارەزوومەندی مەرگن. سندی لەگەڵ باوکی هەیزام ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر و خەڵکان ودانیشتووانی دیمەشق ئاسوودە بوون.

باوکی هەیزام بەرەو حوران کەوتە ڕێ و سندی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەدیمەشق مایەوە تا ئەوەی موسا کوڕی عیسا وەك فەرماندار هاتە ئەو شارە. ئەو دوای مانەوەی بیست ڕۆژە بەشێوەیەکی لەناکاو باوکی هەیزامی گرت و کەسی نارد تا بیبەنە بارەگاکەی. سوپاییەکان گەمارۆیان خستە سەر ماڵی باوکی هەیزام. باوکی هەیزام و کوڕەکەی و کۆیلەکەی هاتنەدەر و لەگەڵ ئەو دەستەیە جەنگان. باوکی هەیزام گیانی خۆی ڕزگار کرد.

هاوەڵانی باوکی هەیزام ئاگادار بوونەوە و بۆ هاوکاری کردنی ئەو بەرێکەوتن.

باوکی هەیزام مەبەستی بوسرای کرد و لەلەجات رووبەرووی سوپاکەی موسا بوویەوە و دەستەیەکی لێ کوشتن و خوێنی بەخوێن شۆردەوە. باوکی هەیزام دوای ئەم سەرکەوتنە درێژەی بەرێگەکەی خۆیدا و بۆ بەیانین نزیکەی پێنج شاسوار هاتنە لای و گفتوگۆیان لەگەڵ کرد. ئەو لای هاورێکانی وەسیەتی کرد و ئەوانی بەجێهێشت و درێژەی بەرێگەکەیدا. ئەم پێشهاتە لەبیستی رەمەزانی ساڵی سەد و حەفتا و حەوت / ٧٩٤ زایینی روویدا.

ئەم دەستە لەلایەن براکەیەوە هاتبوون تا رێگەی بەردەوام بوونی جەنگی لێ بگرن. باوکی هەیزام رازی بوو و لەگەڵ ئەوان رۆشت و فەرمانی بلاوە لێکردنی بەهاوەلانی خۆیدا و ئەمە کۆتایی ئاژاوەکە بوو. باوکی هەیزام لەساڵی ٧٩٨/١٨٢ زایینی کۆچی دوایی کرد.

ئەمە رووداوێك بوو کورتەیەکیمان باس کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی عەبدواحید سوپای ئاندۆلۆسی بۆ جەنگ دژی فەرەنگەکان رازاندەوە و گەیشتە ئۆلییە و قەلاکانی ئەوان. تالانی زۆری دەستکەوت و بێ زیان گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا هوشام کوڕەکەی حەکەمی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی تۆلدۆ دانیشاند و بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانەی کرد و کاروبارەکانی ئەوێی ساماندا. لەوێ کوڕەکەی عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم چاوی بەدنیا هەڵهێنا. عەبدولرەحمان ئەو کەسەیە دوای باوکی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی ئاندۆلۆس دانیشت.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید حاکم کوڕی سلێمانی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا فەزلی خارجی لەنەسیبین ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و پارەی لەخەڵکان سەند و رووی کردە دارا، ئامێد و ئەرزەن و پارەی لێ سەندن. لەگەڵ خەڵکانی خێلاتیش بەمشێوەیە هەڵس و کەوتی کرد و دواتر بۆ نەسیبین گەڕایەوە و هاتە موسڵ. سوپاکەی هێرشیان کردە سەر موسڵ بەلام لەزاب زاری جەنگیان

دۆڕاند. دواتر بەمەبەستی جەنگ گەڕانەوە و فەزڵ وهاورێکانیان کوشت.

لەم ساڵەدا فەرەج کوڕی فەزالە و ساڵح کوڕی بیشر موڕی قورئان خوێن کە لەگێڕانەوەی حەدیس ناتەوان بوون، مردن.

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزم باوکی تاهیری ئەنساری، قازی بەغداد، مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا نوعەیم کوڕی مەسیرەی نەحوی کوفی و باوکی ئەحوەس و باوکی عەوانە کەناوی وەزاح و موالی یەزید کوڕی عەتای لەیسی بوو، مرد. ئەو لەساڵی ٩٢/٧١٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و حەوتی کۆچی (٧٩٣ زایینی)

## جەنگی فەرەنگییان لەگەڵ خەڵکانی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا هوشام پاشای ئاندۆلۆس، سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و عەبدولمەلیك کوڕی عەبدواحید کوڕی موغیسی وەك فەرماندە دەستنیشان کرد. ئەوان ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی دوژمن و گەیشتنە ناوچەکانی ئەربوونە (ناربون) و جەرندە (جرونا). جەنگیان لەجروناوە دەستپێکرد چوونکە پادگانی فەرەنگییەکان لەوێ بوو. سوپاکەی هوشام هێزەکانی ئەو پادگانەیان لەناو برد و بورج و دیوارەکەیان ڕووخاند. ئەوەندەی نەمابوو بەتەواوی دەستی بەسەردا بگرن. لەوێوە بەرەو ئەربوونە بەرێکەوتن و لەوێش هەمان کرداریان گرتەبەر. ڕۆشتنە ناو ئەو سەرزەمینە و شەرتانییەیان بڕی و ڕێزی ئەو شارەیان نەگرت و شەڕکەرانیان کوشتار و بۆ ماوەی چەندین مانگ ئەم سەرزەمینەیان پێشێل کرد، ئاگریان هەڵگیرساند و تالآنییەکانیان کۆکردەوە و دوژمن لەبەرابەر ئەوان هەڵدەهات. سوپای هوشام ڕۆشتنە ناو شارەکانی ئەوان و تەندروست لەگەڵ تالآنییەکان کەکەس جگە لەخوا ئەندازەکەی نازانێت، گەڕانەوە. ئەمە لەبەناوبانگترین جەنگی موسوڵمانان لەئاندۆلۆس بوو.

## دیاریکردنی فەزڵ کوڕی ڕوەح وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە

لەم ساڵە، ١٧٧ کۆچی/٧٨٣ زایینی، ڕەشید فەزڵ کوڕی ڕوەح کوڕی حاتەمی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە دیاری کرد. پێشتر دوای مەرگی ڕوەح، ڕەشید حەبیب کوڕی نەسر موهەلبی لەجێگەی ئەو دانا. بەڵام فەزڵ ڕۆشتە دەرگای بارەگای ڕەشید و خوازیاری فەرمانڕەوایی ئەفریقییە بوو. ڕەشید ڕازی بوو و فەزڵ لەموحەڕەمی ساڵی ١٧٧/ ٧٩٤ زایینی ڕۆشتە ئەفریقییە و برازاکەی، موغەیرە کوڕی بوشر کوڕی ڕوەحی وەك فەرمانڕەوای تونس دەستنیشان کرد. موغەیرە

گەنجێکی بێ ئەزموون بوو و بەهای بۆ سوپاییەکان دانەدەنا.

فەزڵیش دڵی سوپای ڕانەدەگرت و بۆ ئارەزوومەند بوونی ئەوان بۆ نەسر کوڕی حەبیب، فەرمانڕەوای پێش ئەو، بەشێوەیەکی نەشیاو لەگەڵ سوپا هەڵس و کەوتی دەکرد. خەڵکانی تونس کۆبووونەوە و نامەیان بۆ فەزڵ نووسی و لەرازی بوون بەبرازاکەی داوای لێبوردنیان کرد بەڵام فەزڵ وەڵامی نامەکەی ئەوانی نەدایەوە و ئەوان بۆ نافەرمانی کردنی فەرمانەکانی برازاکەی بڕیاریاندا. سالاری خوراسانی کە بەمحەممەد کوڕی فارسی ناودەبرا، پێی وتن: هەردەستەیەکی بێ ڕێبەر، لە لەناوچوون نزیکە. پیاوێك هەڵبژێرن تاکاروباری ئێوە بگرێتە دەست. ئەوان وتەکەی ئەویان پەسەند کرد و بڕیاریاندا فەرماندەیەك لەخۆیان دیاریبکەن کە بەعەبدوالله کوڕی جارود ناودەبرا و بەعەبدوییەی ئەنساری بەناوبانگ بوو. ئەویان هەڵبژارد و پەیمانیان بەست بەگیان و دل ملکەچی فەرمانەکانی بن. ئەوان موغەیرەیان دەرکرد و نامەیان بۆ فەزڵ نووسی: ئێمە مەبەستی نافەرمانی و یاخی بوونمان نییە بەڵام هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ ئێمە نەشیاوە و لەبەر ئەمە دەرمان کرد. فەرماندەیەك بۆ ئێمە دیاری بکە لێی رازی بین.

فەزڵ کوڕە مامەکەی خۆی، عەبدوالله کوڕی یەزید کوڕی حاتەمی وەك فەرماندەی ئەوان دیاری و بۆ سەرزەمینی ئەوان ڕەوانەی کرد. کاتێك لەتونس نزیك بوویەوە، کوڕی جارود کەسانێکی بۆ لای ئەو نارد لەهۆکاری هاتنەکەی بپرسن. فەرمانی بەواندا بێ فەرمانی ئەو هیچ نەڵێن. ئەم دەستەیە ڕۆشتنە لای عەبدوالله. لەرێگە بەیەکیان وت: فەزڵ بەم کارەی مەبەستی هەڵخەڵەتاندنی ئێمەی هەیە و دەخوازێت لەبەر دەرکردنی برازاکەی تۆڵە لەئێمە بستێنێتەوە. لەبەر ئەمە هێرشیان کردە سەر عەبدوالله و خۆی و هاورێکانیان زیندانی کرد. بەمشێوەیە کوڕی جارود و هاورێکانی بەناچاری ئاڵای شۆڕشیان لەبەرابەر فەزڵ بەرز کردەوە و بۆ لەناو بردنی ئەو بڕیاریاندا. کوڕی فارسی، جڵەوی کاروباری گرتەدەست و بۆ هەریەك لەفەرماندەکانی ئەفریقییە و سەرکردەی شارەکان نامەیەکی نووسی. دەقی نامەکان ئەمەیە:

ئێمە لێکۆڵینەوەمان لەکارەکانی فەزڵ لەسەرزەمینی سەروەری باوەڕداران و

خراپەکارییەکانی ئەو کرد و شیاوە لەبەرابەر ئەو ئالآی شۆڕش بەرز بکەینەوە و دەستی ئەو لەسەر خۆمان کورت بکەینەوە. هەرچەندە ئەندێشەمان کرد، کەسمان بۆ چاکەخوازی سەروەری باوەڕداران و خۆشەویستی بۆ سەربازەکان لەئێوە بەشیاوتر نەبینی، بەباشمان زانی خۆمان بکەینە قوربانی ئێوە، ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، ئێوە دەکەینە سەرکردە و سەروەری خۆمان و داوای فەرمانڕەوایی ئێوە لەسەروەری باوەڕداران دەکەین، ئەگەر ژێر کەوتین، کەس پەشیمان نابێتەوە چوونکە خوازیاری ئێوە بووین. سلاوتان لێ بێت.

کوڕی فارسی بەنووسینی ئەم نامە هاوشێوانە بۆ هەموو سەرکردەکان، ئەوانی دژی فەزڵ هاندا. هێزێکی فراوان لەدەوری کوڕی جارود کۆبوویەوە. فەزڵ سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. هێزەکانی کوڕی جارود ڕووبەڕوویان بوونەوە و شەڕێکی قورس دەستیپێکرد. سوپاکەی فەزڵ شکستی خوارد و هەلاتن و تێکشکاو بۆ قەیرەوان گەڕانەوە و هاوەلانی کوڕی جارود شوێنیان کەوتن و هەمان ڕۆژ گەمارۆیان خستە سەر قەیرەوان. دواتر خەڵکی قەیرەوان دەروازەکانیان کردەوە و کوڕی جارود و سوپاکەی لەجومادی الاخری سالی ١٧٨/ سێپتامبەری ٧٩٥ زایینی ڕۆشتنە ناو قەیرەوان و فەزڵیان لەقەیرەوان دەرکرد. کوڕی جارود کەسان و بنەماڵەکەی ئەوی ڕەوانەی کابس کرد و هەمان ڕۆژ بەرەو کابس بەرێکەوتن. بەلام کوڕی جارود ئەوانی گەڕاندەوە و سەری فەزڵ کوڕی روەح کوڕی حاتەمی پەڕاند.

کاتێك فەزڵ کوژرا، دەستەیەك لەسوپاکەی تورە بوون و بۆ کوشتنی کوڕی جارود پەیمانیان بەست. کوڕی جارود بەمەبەستی جەنگ سوپایەکی ڕەوانە کرد بەلام سوپاکەی ڕووبەڕووی شکست بوویەوە. کوڕی جارود لەم کاتەدا لەتونس بوو، خۆی بەوان گەیاند و دوای هاتنی کوڕی جارود بۆ قەیرەوان دوژمنان بلاوەیان لێکرد و شکستیان خوارد. کوڕی جارود هێرشی کردە سەریان و لەناوی بردن. کوڕی جارود ژمارەیەکی زۆری کوشت و دەستەیەك لەسەرکردەکانی ئەوانی کردە خۆراکی شمشێر و ئەوان هەلاتنیان بەکارێکی پەسەند زانی. هەلاتووان خۆیان گەیاندە ئەربەس و فەرمانداری شاری زاب، عەلا کوڕی سەعیدیان وەك

ڕێبەری خۆیان دەستنیشان کرد و سەرلەنوێ سوپایەکیان بۆ هێرش کردنە سەر قەیرەوان ئامادە کرد.

## فەرمانڕەوایی هەرسیمە کوڕی ئەعیەن لەسەرزەمینی ئەفریقییە

کاتێك عەلا و هاوڕێکانی مەبەستی هێرش کردنە سەر قەیرەوانیان کرد، یەحیا کوڕی موسا گەیشتە لای هارون ڕەشید. هۆکاری ئەو لەڕۆشتنی بۆ لای ڕەشید ئەو هەواڵانە بوو سەبارەت بەکوشتاری کوڕی جارود و خراپەکارییەکانی ئەو بیستبووی. ڕەشید هەرسیمە کوڕی ئەعیەنی بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد و یەحیا کوڕی موسای کردە هاوڕێی چوونکە یەحیا لەناو خوراسانییەکان پێگەیەکی بەرزی بوو. ڕەشید فەرمانی بەهەرسیمەدا یەحیا پێش خۆی بنێرێت و لەگەڵ کوڕی جارود ڕێگەی سازان بگرێتەبەر و دڵنەوایی بکات تا پێش گەیشتنی هەرسیمە، ملکەچی خۆی نیشان بدات. یەحیا ڕۆشتە قەیرەوان و لەنێوان ئەو کوڕی جارود، گفتوگۆیەکی دوور و درێژ ئەنجامدرا. یەحیا نامەی ڕەشیدی پێدا. کوڕی جارود بەڵێنی فەرمانبەری و ملکەچی دا و وتی: عەلا کوڕی سەعید لەگەڵ بەربەرییەکان مەبەستی لەناو بردنی منیان کردووە، ئەگەر لەقەیرەوان بڕۆمەدەر، بەربەرییەکان دێن و شارەکە تاڵان دەکەن و بەمشێوەیە سەرزەمینی سەروەری باوەڕداران بەفیرۆ دەدەم. ڕێگە بدەن دژی ئەوان سوپایەك کۆبکەمەوە، ئەگەر بەسەر مندا زاڵ بوو، خۆتان دەزانن و خەڵکان، ئەگەر من سەرکەوتم، چاوەڕوانی هاتنی هەرسیمە دەکەم تا هەموو ناوچەکان بەوبسپێرم و خۆم دەڕۆمە دەرگای سەروەری باوەڕداران.

لەم کارەی تەنیا مەبەستی بەفیڕۆدانی کات بوو چوونکە ئەگەر بەسەر عەلا سەردەکەوت، دەستی هەرسیمەی لەم سەرزەمینە کورت دەکرد. یەحیا هەستی بەمە کرد و لەگەڵ کوڕی فارسی بەشێوەیەکی نهێنی قسەی کرد. کوڕی فارسی لەمەبەستەکەی خۆی داوای بەخشینی کرد، سوێندی ئەمەکداری خوارد و توانای خۆی خستە گەڕ بۆ ئەوەی بەلاڕێیدا ببات. ئەو دەستەیەك لەسوپاییەکانی هاندا و ئەوان گوێڕایەڵی بوون و بەمشێوەیە ژمارەی شوێنکەوتەکانی فراوان و بۆ

ڕووبەڕوو بوونەوەی کوڕی جارود بەڕێکەوت. کوڕی جارود بەیەکێك لەهاوەڵانی خۆی بەناوی تالبی وت: کاتێك لەبەرابەر یەك ریزمان بەست، کوڕی فارسی بانگ دەکەم بۆ ئەوەی سەرکۆنەی بکەم و تۆ لەم کاتەدا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی بکەسەر و خوێنی برێژە. تالیب ڕازی بوو. دوو سوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەست. کوڕی جارود محەممەد کوڕی فارسی بانگ کرد و لەگەڵی ئاخاوت. تالیب بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر و گیانی گرت. کوڕی جارود سوپاکەی ئەوی تێکشکاند و یەحیا کوڕی موسا سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی بەرەو تەرابلوس هەڵات تا پەیوەستی هەرسیمە ببێت.

عەلا کوڕی سەعید کاتێك پەیوەست بوونی خەڵکان بەهەرسیمەی بینی، پەیوەستی بوو. بەمشێوەیە ژمارەی سوپاییەکانی زیادی کرد و لەهەر سووچ و قوژبنێکەوە لەدەوری کۆبوونەوە. هەرسیمە مەبەستی کوڕی جارودی کرد. کوڕی جارود دڵنیا بوو لەوەی دەرئەنجامی ئەم جەنگە لەبەرژەوەندی ئەو نابێت و لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ یەحیا کوڕی موسا نووسی و بانگی کرد تا قەیرەوانی پێ بسپێرێت. یەحیا لەموحەرەمی ١٧٩/ ژانویەی ٧٩٦ زایینی لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەتەرابلوسەوە بەڕێکەوت و کاتێك گەیشتە کابس، هەموو سوپاییەکان پەیوەستی بوون. کوڕی جارود لەسەرەتای مانگی سەفەر/ مەی ٧٤٩ زایینی لەقەیرەوان ڕۆشتەدەر. فەرمانڕەوایی ئەو حەوت مانگ درێژەی کێشا.

عەلا کوڕی سەعید و یەحیا کوڕی موسا ڕوویان کردە قەیرەوان و هەرکام دەیویست گرتنی ئەو شارە بەناوی خۆیەوە تۆمار بکات. عەلا پێش کەوت و دەستەیەك لەهاوەڵانی کوڕی جارودی کوشت. ئەو ڕووی کردە هەرسیمە. کوڕی جارود بۆ لای هەرسیمە بەڕێکەوت. هەرسیمە ئەوی بۆ بارەگای ڕەشید ڕەوانە کرد و لەڕووداوەکان ئاگاداری کردەوە و نووسی عەلا کوڕی جارودی بۆ فەرمانبرداری ناچار کردووە. ڕەشید فەرمانی بۆ نووسی تا عەلا بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات و کاتێك عەلا گەیشتە بارەگای ڕەشید، لەلایەن ڕەشیدەوە چەندین پاداشت و دیاری گرانبایی پێ بەخشرا. زۆری نەخایاند عەلا لەمیسر مرد. کوڕی جارود لەبەغداد زیندانی کرا و هەرسیمە ڕێگەی قەیرەوانی گرتەبەر و لەرەبیع الاولی ساڵی ١٧٩/

مەی ٧٩٦ گەیشتە ئەو سەرزەمینە و ئارامی و ئاسایشی بەخەڵکان بەخشی. لەمۆنەستیر لەساڵی ١٨٠/٧٩٦ زایینی کۆشکێکی بەرز کردەوە و دیواری شاری تەرابلوسی بەرووی دەریادا دروست کرد.

ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب کە لەشارەکانی زاب بوو، دیاری زۆری پێشکەشی هەرسیمە کرد و خۆشەویستی خۆی نیشاندا و لەبەر ئەمە هەرسیمە ئەوی وەك فەرمانداری زاب دەستنیشان کرد. ئەو، ڕێگەی چاکەکاری گرتەبەر.

عەیاز کوڕی وەهب هەواری و کولەیب کوڕی جومەیعی کەلبی دەستەیەکیان کۆکردەوە و مەبەستی جەنگ دژی هەرسیمەیان کرد. هەرسیمە، یەحیا کوڕی موسای لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد. یەحیا بڵاوەی پێکردن و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و بۆ قەیرەوان گەڕایەوە.

کاتێك هەرسیمە ناسازگارییەکانی ئەفریقییەی بینی، بەردەوام نامەی بۆ ڕەشید دەنووسی و داوای دەکرد لەم کارە بیبەخشێت. ڕەشید فەرمانی پێدا بەرەو عێراق بەڕێکەوێت. ئەو لەرەمەزانی ساڵی ١٨١/ ئۆکتۆبەری ٧٩٧ زایینی لەئەفریقییە ڕۆشت. فەرمانڕەوایی ئەو دوو ساڵ و نیو درێژەی کێشا.

## ئاژاوەی موسڵ

لەم ساڵەدا عەتاف کوڕی سوفیان لەشاسوارەکانی موسڵ، ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ڕەشید گرتەبەر و چوار هەزار کەسی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و باجی وەرگرت هەرچەند کارگوزاری ڕەشید لەموسڵ محەممەد کوڕی عەباسی هاشمی یا عەبدولمەلیك کوڕی ساڵح بوو بەڵام عەتاف کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد. خۆی باجی وەردەگرت و بۆ ماوەی دوو ساڵ بەمشێوە بوو تا ڕەشید هاتە موسڵ و دیواری ئەو شارەی بەبیانووی بوونی عەتاف لەوێ، وێران کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ڕەشید، جەعفەر کوڕی یەحیای لەمیسر لابرد و ئیسحاق کوڕی سلێمانی لەجێگەی ئەو دانا. حەمزە کوڕی مالکی لەخوراسان لابرد و فەزڵ کوڕی

یەحیای بەرمەکی لەجێگەی ئەو دانا، رەی و سەجستان و ناوچەکانی دیکە لەو کاتەدا پەیوەستی خوراسان بوون.

لەم ساڵەدا عەبدرەزاق کوڕی عەبد حەمیدی تەغلەبی لەهاویندا جەنگی کرد.

لەموحەرەمی ئەم ساڵە/ ژانویەی٧٩٤ زایینی تۆفانێکی قورس هەڵیکرد و جارێکی دیکە لەمانگی سەفەر/مەی ٧٩٤ زایینی تۆفان روویدا.

لەم ساڵەد رەشید سەرپەرەستی حاجییەکانی گرتە ئەستۆ.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبد واحید کوڕی زیاد مرد. دەستەیەك مەرگی ئەو دەگێڕنەوە بۆ ساڵی ١٧٠/٧٨٦ زایینی.

لەم ساڵەد شەریك کوڕی عەبدوللەی نەخەعی و جەعفەر کوڕی سلێمان مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و هەشتی کۆچی ( ٧٩٤ زایینی )

### ئاژاوەی میسر

لەم ساڵەدا حوفییەکانی میسر دژی فەرماندارەکەیان ئیسحاق کوڕی سلێمان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و خوێنیان ڕشت. ڕەشید بەڕەوانە کردنی هەرسیمە کوڕی ئەعیەن کەکارگوزاری فەلەستین بوو، هاوکاری کرد. ئەم سوپایە کە لەخەڵکانی قەیس و قوزاعە بوون، ڕووبەڕووی حوفییەکان بوونەوە و شکستیان پێهێنان و بۆ فەرمانبردن ناچاریان کردن. ڕەشید ئیسحاقی لەمیسر لابرد و هەرسیمەی بۆ ماوەی یەك مانگ وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دیاریکرد. دواتر ئەوی لابرد و عەبدولمەلیك کوڕی ساڵحی لەجێگەی ئەو دانا.

### شۆڕشی وەلید کوڕی تەریفی خارجی

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی تەریفی تەغلەبی لەجەزیرە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ئیبراهیم کوڕی خازم کوڕی حوزەیمەی بەشێوەیەکی لەناکاو لەنەسیبین کوشت. مەزنی ئەو زیادی کرد و ڕۆشتە ئەرمەنستان و بۆ ماوەی بیست ڕۆژ گەمارۆی خستە سەر خیلاط و خەڵکی ئەو سەرزەمینە سی هەزار دیناری سووربیان پێدا. ئەو ڕووی کردە ئازەربایەجان و دواتر حیلوان و سواد (دەوروبەری عێراق) و مەبەستی شاری بەلەدی کرد. ئەوان سەد هەزار دیناری سووربیان پێدا. ئەو لەسەرزەمینی جەزیرە خراپەکاری کردە پیشە. ڕەشید، یەزید کوڕی مەزید کوڕی زائیدەی شەیبانی کەبرازای مەعن کوڕی زائیدە بوو، بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. وەلید وتی:

ستعلم یا یزید اذا التقینا                بشط الزاب ای فتی یکون

واتاکەی: تۆ ئەی یەزید ئەگەر لەکەنارەکانی زاب ڕووبەڕووی یەك ببینەوە دەزانی کام یەك لەئێمە جوامێر دەبێت.

یەزید ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر. بەرمەکییەکان کەپەیوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ یەزید نەبوو، بەڕەشیدیان وت: یەزید بۆ ئاسوودەی خۆی، بارودۆخ لەوەلید

دژوار ناکات چوونکە هەردووکیان لە (وائل)ن. ئەوان کارەکەی وەلیدیان لای ڕەشید بەکەم بەها وەسف کرد. ڕەشید توڕە نامەیەکی بۆ یەزید نووسی و وتی: ئەگەر چەند کەسێك لەخزمەتکارەکانم بۆ ئەو دیارە دەنارد، باشتر لەتۆ کۆتایی بەو کێشە دەهێنا بەلاّم تۆ پیاوێکی زمان چەوریت و تەنیا گرنگی بەکەسە نزیکەکانی خۆت دەدەیت. سوێند بەخوا ئەگەر لەزووترین کات کۆتایی بەم کێشە نەهێنیت، کەسێك دەنێرم سەری تۆم بۆ بێنێت. یەزید بەپەلە لەئێوارێی پێنج شەممەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٧٩/ نۆڤەمبەری ٧٩٦ زایینی بۆ جەنگی وەلید بەرێکەوت. دەڵێن: لەکاتی جەنگەکەدا تینویەتی بەرادەیەکی ئەوتۆ زۆری بۆ هێنا کەئەنگوستیلەکەی خستە دەمی و دەیمژی و دەیوت: خواوەندا! چ سەختییەکەی گیانبڕە، لەچاوی دوژمنی بشارەوە. بەهاوەڵانی خۆی دەوت: دایك و باوکم بەقوربانتان بێت، ئەوانە هەموویان خەوارجین و لەسەرتای جەنگ هێرش دەکەن، خۆڕاگری بکەن و هەرکات هێرشەکانیان کۆتایی پێهات، هێرشیان بکەنەسەر، ئەگەر هەلاّتن، جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە.

پێشبینییەکەی ڕاست بوو: خەواریج هێرشیان کرد و یەزید و سوپاکەی خۆڕاگرییان کردە پیشە. دواتر یەزید و هاورێکانی هێرشیان برد و بلاّوەیان بەسوپاکەیانکرد. دەگێڕنەوە ئەسەد کوڕی یەزید بەرادەیەك هاوشێوەی باوکی بوو کەتەنیا جیاوازی نێوانیان جێگەی زەربەی ئەو شمشێرە بوو لەشوێنی ڕوانی مووی دەم و چاوی یەزید دەستی پێدەکرد و تا ناوچاوی درێژ دەبوویەوە. ئەسەد ئارەزووی دەکرد زەربەیەکی هاوشێوەی بەرکەوێت تا هەمان نیشانەی باوکی لەسەر روخسار بێت. شمشێرێکی بۆ هاتە خوار، روخساری لەژێر خودەکەی دەرهێنا و شمشێرەکە ناوچاوی هەڵدڕی. دەڵێن: ئەم زەربەیە نیشانەیەکی هاوشێوەی باوکی لەروخساریدا دروست کرد و چیتر ئەو دووانە لەیەك جیا نەدەکرانەوە.

یەزید شوێن وەلید کوڕی تەریف کەوت و سەری لەجەستە جیا کردەوە. یەکێك لەشاعیرەکان دەڵێت:

وائل بعضهم يقتل بعضا      لا يفل الحديد الا الحديد

واتاکەی: وائل خوێنی یەك دەڕێژن و ئاسن تەنیا دەتوانین بەئاسن بیبڕینەوە.

کاتێك تەریف کوژار، خوشکەکەی لەیلا کچی تەریف، جل وبەرگی جەنگی پۆشی و هێرشی کردە سەر هێزەکانی یەزید بەڵام ئەویان ناسییەوە. یەزید فەرمانیدا ئازادی بکەن. دواتر لێی نزیك کەوتەوە، ڕمێکی لەسمتی ئەسپەکەی دا و وتی: دوور کەوەرەوە، خوا دوورت بکات، بنەماڵەی ئێمەت ریسوا کرد، ئەو ژنە شەرمەزار و سەرشۆڕ ڕۆشت لەکاتێکدا ئەم هۆنراوەی لەپرسەی براکەیدا دەخوێندەوە:

| | |
|---|---|
| بتل تبا ثارسم قبر کانه | على علم فوق الجبال منيف |
| تضمن جودا حاتميا و نائلا | و سورة مقدام و قلب حصيف |
| الا قاتل الله الجثى كيف اضمرت | فتى كان بالمعروف غير عفيف |
| فان يك اراده يزيد بن مزيد | فيا رب خيل فضها و صفوف |
| الا يا لقومى للنوائب و الردى | و دهر ملح بالكرام عنيف |
| و للبدر من بين الكواكب قد هوى | و للشمس همت بعده بكسوف |
| فيا شجر الخابور ما لك مورقا | كانك لم تجزع على ابن طريف |
| فتى لا يحب الزاد الا من التقى | و لا المال الا من قنا و سيوف |
| و لا الخيل الا كل جرداء شطبة | و كل حصان باليدين عروف |
| فلا تجزعا يا ابنى طريف فاننى | ارى الموت نزالا بكل شريف |
| فقدناك فقدان الربيع فليتنا | فديناك من دهمائنا بألوف |

واتاکەی: لەتەپۆڵکەی تەباسا نیشان لەگۆڕێکە وەك بڵێی ئالآیەکە لەسەر کێوێکی بەرز، کەهەڵگری بەخششێکی فراوان هاوشێوەی حاتەمی تاییە و بوێرێکی دلێری هێرشبەر و دڵێکی فرەزانی لەگەڵدایە. خواوەند ئەم گۆڕەی لەناو برد کەچۆن جوامێرێکی لەخۆیدا شاردۆتەوە کەهەرگیز خۆی لەچاکەکاری نەدەدزییەوە. هەرچەند یەزید کوڕی مەزید ئەوی لەناو برد، بەڵام چەندین سوپا و دەستەی دیکەی تێکشکاند. ئەی خەڵکی من! چیتر بۆ زیان و بەلا و ڕۆژگارێك کە بەپێداگری بارودۆخ لەسەر ڕێزداران دژوار دەکات ( چ کەسێك ماوەتەوە) مانگێکی تەواو لەناو ئەستێرەکان کەوت و هەتاو دوای ئەو گیرا. ئەی دارەکانی خابور (ناوچەیەك لەجەزیرە) چیتر بۆ گەڵا دەردەکەن، دەڵێی بۆ مەرگی تەریف یەخەی

خۆتان نادڕن. ئەو جوامێرێك بوو جگە لەخواپەرەستی هیچ کالاَیەکی پەسەند نەدەکرد و تەنیا بەبەریەك کەوتنی شمشێر و ڕمی جەنگ، تالانی دەست نەدەکەوت. بەشێوەیەك ئەسپێکی جگە لەئەسپی خۆش ئەندام و بەتوانا و یالدار پەسەند نەدەکرد. ئەی دوو منالەکەی تەریف (دوو براکەی) مەگرین چوونکە مەرگ دەبینم ئامێز بۆ هەموو ڕێزداران دەکاتەوە. ئێمە هاوشێوەی بەهار تۆمان لەدەستدا بەلاَم خۆزگە هەزاران سەرمان لەبەهای ئەم پرسەدا دەدا.

موسلیم کوڕی یەزید لەکاتی کوژرانی وەلید و کەمتەرخەمی یەزید لەجەنگ دژی وەلید هۆنراوەیەکی هۆنییەوە کەچەند دێرێکی دەهێنینەوە:

| | |
|---|---|
| یفتر عند افترار الحرب مبتسما | اژا تغیر وجه الفارس البگل |
| موف علی مهج فی یوم ژی رهج | کانه اجل یسعی الٰی أمل |
| ینال بالرفق ما یعیا الرجال به | کالموت مستعجلا یأتی علی مهل |

واتاکەی: ئەو لەکاتی بزەی جەنگ، بزەی لێدەدا، و بزەی جەنگ ئەو کاتەیە شاسواری بوێر ڕەنگی روخساری دەگۆڕێت. ئەو لەرۆژی پەرێشانی و جەنگ، خوێنی دڵ دڕژێنێتە سەرزەوی وەك بڵێی پەیکی مەرگە و بەرەو ئارەزووەکەی دەڕوات (یا ئارەزوو هاوشێوەی پەیکی مەرگ دەبڕێت، ئەو بەئارامی و درەنگ کردن، بارێك لەسەر شان هەڵدەگرێت کەچۆك بەپیاوان دادەدات. هاوشێوەی مەرگ هەرچەند بەپەلەیە، بەلاَم بەئارامی هەنگاو هەڵدەگرێت.

## جەنگی فەرەنگییەکان و جەلالقە لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا هوشام پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بەفەرماندەیی عەبدکەریم کوڕی عەبد واحید کوڕی مەغیس بۆ سەرزەمینی فەرەنگ ڕەوانە کرد. ئەو گەیشتە ئۆلیە و قەلاَکانی وێران و تالاَنییەکانی کۆکردەوە و تەندروست گەڕایەوە.

هوشام سوپایەکی دیکەی بەفەرماندەیی براکەی عەبدکەریم، عەبدولمەلیك کوڕی عەبد واحید بۆ سەرزەمینی جەلالیقە ( گالیسیا) ڕەوانە کرد. عەبدولمەلیك کۆشکی پاشاکەیان ئەزفونش و کەنیسەکانی وێران کرد، تالاَنییەکانی کۆکردەوە.

بەڵام کاتێك گەڕانەوە، ڕێنیشاندەر ئەوانی بەلاڕێدا برد و بەمشێوەیە گرفتاری دژواری و سەختی بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان مردن و چوارپێکانیان ڕەمیان کرد و تەنیا دەستەیەکی کەمیان بێ ئەوەی زیانیان پێ بگات، تەندروست گەڕانەوە.

## ئاژاوەی تاکورنا

لەم ساڵەدا ئاژاوەی تاکورنا لەئاندۆلۆس روویدا. بەربەرییەکان نافەرمانی فەرمانەکانیان کرد و فێڕۆیی و وێرانکارییان نایەوە، هێرشیان کردە سەر شارەکان و ڕێگەکانیان گرت. هوشام سوپایەکی بەفەرماندەیی عەبدقادر کوڕی ئەبان کوڕی عەبدوالله موالی معاویە کوڕی سوفیان بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە جەنگا، بەربەرییەکان یا کوژران یا گرفتار بوون، ئەوەی مایەوە، لەناو هۆزەکەیدا خۆی حەشاردا. گوندی تاکورنا و کوێستانەکانی تا حەوت ساڵ هیچ کەسێکی بەخۆیەوە نەبینی.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

معاویە کوڕی زوفەر کوڕی عاسم لەم ساڵەدا جەنگی هاوینەی ئەنجامدا و جەنگی زستانە بەفەرماندەیی سلێمان کوڕی راشد بەهاورێیەتی بەند بەتریرکی سەقالییە (سیسیل) ئەنجامدرا.

سەرپەرەستی حاجییەکان لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەلی بوو.

لەم ساڵەدا ڕەشید هەموو کارەکانی خەلافەتی خۆی بەیەحیا کوڕی خالیدی بەرمەکی سپارد.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی یەحیا گەیشتە خوراسان و لەگەڵ دانیشتووانی ماوەرا ئەلنەهر جەنگی دەستپێکرد و فەرمانداری ئەشروسنە کەملکەچی فەرمانەکان نەدەبوو، هاتە لای یەحیا. فەزڵ لەخوراسان چەندین مزگەوت و کاروان سەرای دروست کرد.

لەم ساڵەدا عەبدوارست کوڕی سەعید و موفەزەل کوڕی یونس و جەعفەر کوڕی سلێمانی زەبعی مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و حەفتا و نۆی کۆچی ( ٧٩٥ زایینی )

## جەنگی فەرەنگییەکان لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا هوشام پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی عەبدولمەلیك کوڕی عەبدواحید کوڕی موغیس بەرەو گالیسیا ڕەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە ئەستورقە (ئاستورگا). ئەزفونش (ئالفۆنسۆ) پاشای خەڵکانی گالیسیا بوو. هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و پاشای بەشکەنس کەدراوسێی بوو هەروەها مەجوسی نزیك ئەوان و دانیشتووانی ئەم کەنارانە هاوکارییان کرد و بەمشێوەیە سوپایەکی گەورەیان پێکهێنا. عەبدولمەلیك هێرشی کردەسەر و ئەلفۆنسۆ گۆڕەپانی بەجێهێشت. عەبدولمەلیك شوێن سوپاکەی کەوت و هەرکەسی دەگرت، دەیکوشت. عەبدولمەلیك سامانەکانی ئەو سەرزەمینەی بەفیڕۆدا و تالآنییەکانی کۆکردەوە و کوشتاری کرد. ئاوەدانییەکانی وێران و پەردەی سەرزەمینی ئالفۆنسۆی دڕاند و بێ زیان گەڕایەوە.

هوشام سوپایەکی دیکەی لەقۆڵێکی دیکەوە ڕەوانە کرد. ئەوانیش لەسەر بنەمای بڕیاری پێشوو، لەگەڵ عەبدولمەلیك لەڕێگەوە گەیشتن، وێرانییان دروست کرد و تالآنییەکانیان کۆکردەوە. کاتێك مەبەستی هاتنە دەرەوەیان کرد، سوپای فەرەنگ ڕێگەی لێ گرتن و زیانی لێدان. ژمارەیەك لەموسوڵمانەکانیان کوشتار کرد بەلآم پاشماوەی موسوڵمانەکان گیانیان ڕزگار و بێ زیان – جگە لەکوژراوەکان– گەڕانەوە.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی یەحیا لەخوراسان گەڕایەوە و ڕەشید، مەنسور کوڕی یەزید کوڕی مەنسوری حیمەیری، خاڵۆی مەهدی لەجێگەی ئەو دانا.

ڕەشید لەمانگی رەمەزان/ نۆڤەمبەری ٧٩٦ زایینی بۆ سپاس کردن لەکوژرانی وەلید کوڕی تەریف حەجی عەمرەی کرد و بۆ مەدینە گەڕایەوە و تاکاتی حەجی

(تمتع) لەوێ مایەوە. لەگەڵ خەڵکان حەجی تمتع یان کرد، ڕێگەی مەککە بۆ مەنی و دواتر بۆ عەرەفات و هەموو ڕێگەکانی بەپێ بڕی و لەڕێگەی بەسرەوە گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا حەمزە کوڕی ئەترەکی سەجستانی لەخوراسان قووت بوویەوە.

لەم ساڵەدا حەماد کوڕی زەید کوڕی دەرهەمی ئەزدی سەرکردەی ئەزد و مالك کوڕی ئەنسی ئەسبەحی مامۆستای شافیعی و موسلیم کوڕی خالیدی زەنجی باوکی عەبدوالڵەی فەقیە لەمەدینە کۆچی دواییان کرد. شافیعی پێش مالك پەیوەندی لەگەڵ ئەنسدا بوو، زانستی فقە لەو فێر بوو. پێیان دەوت زەنجی چوونکە سپی بووە و سووری بەسەر ڕوخساریدا زاڵ. هەروەها لەم ساڵەدا عیباد کوڕی عیباد کوڕی حەبیب کوڕی موهەلیب کوڕی باوکی سوفرەی موهەلبی بەسری و باوکی ئەحوەس سەلام کوڕی سەلیمی حەنەفی مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتای کۆچی ( ٧٩٦ زایینی )

### مەرگی هوشام

لەم ساڵەدا هوشام کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی معاویە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان پاشای ئاندۆلۆس لەمانگی سەفەر/ ئاوریلی ٧٩٧ زایینی کۆچی دووایی کرد. فەرمانڕەوایی ئەو حەوت ساڵ و حەوت مانگ و هەشت ڕۆژ و بەگومانێك نۆ مانگ و دە ڕۆژی خایاند. ساڵەکانی ژیانی لەسی و نۆ ساڵ و چوار مانگ کۆتایی پێهات. نازناوەکەی باوکی وەلید و کەنیززادە بوو ( دایکی دایکی مناڵ بوو) ڕوخساری سپی و چاوەکانی خۆڵەمێشی و سورباو و چاوخێڵ بوو. پێنج منالی بۆ هاتە دنیا. کارزانێکی دوورئەندێش بوو، بوێر، دادپەروەر، چاکەکار و خۆشەویستی چاکەکاران بوو. بۆ جیهاد هەوڵی دەدا.

یەکێك لەچاکترین کارەکانی لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەوە بوو ماڵیاتی لەسەر بنەمای قورئان و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) وەردەگرت. دروست کردنی مزگەوتی هەینی کوردوبای تەواو کرد. باوکی پێش ئەوەی ئەم مزگەوتە تەواو ببێت، مرد. بناغەی چەندین مزگەوتی دیکەی داڕشت. ئیسلام لەڕۆژگاری ئەو گەشەی کرد و ناباوەڕی لەسەرزەمینەکەی کۆچی کرد بەشێوەیە موسوڵمانێك لەسەرەمەرگ وەسیەتی کرد موسوڵمانێك لەزیندان ئازاد بکەن بەڵام لەسەرزەمینی ناباوەڕان تەنانەت یەك زیندانی موسوڵمان نەبینرا تا ئازادی بکەن. ئەمە نیشانەی بەتوانایی موسوڵمانان و ناتەوانی ناباوەڕانی ڕۆژگاری ئەوە.

چاکەکارییەکانی فراوانن. ئەندلۆسییەکان بەردەوام بیری دەکەنەوە. هەندێ کات زێدەڕۆییان کردووە و شێوازی خەلافەتی ئەو بەعومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەشوبهێنن.

### فەرمانڕەوایی حەکەم، کوڕەکەی هوشام

کاتێك هوشام مرد، کوڕەکەی حەکەم (بەنازناوی مونتەسیر) لەسەر تەختی

خەلافەت دانیشت. حەکەم بەهێز، دوورئەندێش و یەکەم کەس بوو کۆیلە بەزێڕکراوەکانی ئەندۆلۆسی فراوان کرد و لەدەوروبەری کۆشك، چەندین ئەسپی ئامادەی ڕاگرت.

حەکەم خۆی کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد. زمان پاراو بوو، کاتێك فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، دوو مامەکەی عەبدوڵلە و سلێمان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە. ئەوان لەدەشتەکانی ڕۆژئاوا بوون. عەبدوالله بەلەنسی خۆی بەئاندۆلۆس گەیاند ودەستی بەسەر بەلەنسیەدا گرت. براکەی سلێمان کە لەتانژە بوو، پەیوەستی بوو و خەڵکانیان دژی حەکەم هاندەدا و ئاگری ئاژاوەیان خۆش کرد. چەند جارێك شەڕیان کرد بەڵام هەمیشە حەکەم سەردەکەوت.

دواتر حەکەم بەسەر سلێمانی مامی سەرکەوت و لەساڵی ١٨٤/٧٨٠ زایینی کوشتی. عەبدوالله لەوالنسیا بوو، ترساو پەرێشان دەستی لەیاخیگەری هەڵگرتبوو. نامەی ئاشتی و سازانی بۆ حەکەم نووسی و حەکەم رازی و لەساڵی ١٨٦/٧٨٢ زایینی پەیمانی ئاشتییان واژۆ کرد. کوڕەکانی عەبدوالله خوشکەکانی حەکەمیان وەك هاوسەر هەڵبژارد و بەم شێوەیە ئاگری ئاژاوە دامرکایەوە.

ئەوکاتەی حەکەم سەرقاڵی دامرکاندنەوەی ئاگری مامەکانی خۆی بوو، فەرەنگییەکان ئەم دەرەفەتەیان بەهەل زانی و مەبەستی گرتنی سەرزەمینە ئیسلامییەکانیان کرد و شاری بارسەلۆنیان گرت. ئەوێیان بەشاری خۆیان لەقەڵەمدا و هاورێکانی خۆیان لەوێ نیشتەجێ کرد. سوپای موسوڵمانان نەیتوانی لەکاتی خۆیدا بگاتە شارەکە. گرتنی ئەم شارە لەساڵی ١٨٥/٧٨١ زایینی روویدا.

## جەنگ لەگەڵ فەرەنگییەکانی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا حەکەم، پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بەفەرماندەیی عەبدکەریم کوڕی موغیس بۆ سەرزەمینی فەرەنگەکان ڕەوانە کرد. ئەوان ڕۆشتنە ناو سەرزەمینەکانیان و بڵاوەیان بەسوپاکانی ئەوان کرد و ژمارەیەکیان لێ کوشتن و ناوچەکانی ژیانییان سووتاند. دەستەیەك لەموسوڵمانان لەکاتی داکشانی ئاو

لەرووبارەکە پەڕینەوە. فەرەنگییەکان بەگومانی ئەوەی کەس توانای پەڕینەوە لەم رووبارەی نییە، سامان و دارایی خۆیان لەوبەری رووبار دانابوو. بەڵام لەکۆتاییدا ئەوە روویدا کەهەرگیز بیریان لیٚ نەدەکردەوە و موسوڵمانان هەموو سامانی ئەوانیان تالاّن کرد. پیاوەکانیان گرفتار کرد و تا ئەو جێگەی دەیانتوانی، کوشتاریان خستەگەڕ، ئابروویان بردن وبیٚ زیان بۆ لای عەبدکەریم گەڕانەوە.

دەستەیەکی دیکەیش ڕەوانە کران و چەندین شوێنی سەرزەمینی فەرەنسایان وێران کرد. سامانی خەڵکەکەیان وەك تالاّنی کۆکردەوە و پیاوەکانیان گرفتار کرد. دەستەیەك لەئەسیرەکان عەبدکەریمیان ئاگادار کردەوە کەدەستەیەك لەشەڕکەرانی فەرەنگ پێشتر خۆیان گەیاندۆتە دۆڵێکی سەر ڕێگەی موسوڵمانان. عەبدکەریم سوپاییەکانی کۆکردەوە و بۆ جەنگی ئەوان بەرێنەکەوتبوون. ناباوەڕان نەکەوتبوونە خۆ کەموسوڵمانانیان لەبەرابەر خۆیاندا بینی. عەبدکەریم و سوپاکەی بەڕادەیەك جەنگان کەفەڕەنگییەکان ناچار بەهەلاّتن بوون و موسوڵمانان کەرەستەکانی جەنگیان وەك تالاّنی کۆکردەوە و عەبد کەریم و سوپاکەی بیٚ زیان گەڕانەوە.

## فەرمانڕەوایی عەلی کوڕی عیسا لەخوراسان

لەم ساڵەدا ڕەشید مەنسور کوڕی یەزیدی لەخوراسان لابرد و عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهانی لەجێگەی ئەو دانا. ئەو دە ساڵ فەرمانڕەوایی ئەو دیارەی کرد. لەدەورانی فەرمانڕەوایەتی ئەو حەمزە کوڕی ئەترەك لەخەواریج ئالاّی شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو بەرەو پوشەنج بەرێکەوت و عەمرویە کوڕی یەزیدی ئەزدی رووبەرووی بوویەوە. ئەو کە فەرمانڕەوای هەرات بوو لەگەڵ شەش هەزار کەس رووبەرووی حەمزە بوویەوە بەلاّم حەمزە شکستی پیٚهێنا و ژمارەیەك لەسوپاکەی کوشت. عەمرویە لەناو قەرەباڵغی کەوتە ژێر پیٚ و مرد. عەلی کوڕی عیسا کوڕەکەی، حسەینی لەگەڵ دەهەزار شەڕکەر بۆ شەڕی حەمزە ڕەوانە کرد. کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، حسەین ترسا ودەستی لەجەنگ هەڵگرت. عەلی کوڕی عیسا فەرماندەیی لیٚ سەندەوە و کوڕەکەی دیکەی عیسا کوڕی عەلی بۆ شەڕی

حەمزە ڕەوانە کرد. بەڵام حەمزە شکستی پێهێنا و دووەبارە باوکی ئەوی بۆ شەڕی حەمزە ڕەوانە کردەوە.

حەمزە لەنەیشابوور و عیسا کوڕی عەلی لەخەزەر ڕووبەڕووی بوویەوە. ئەم جارە حەمزە شکستی خوارد و سوپاکەی کوژران. تەنیا چل کەسی لەگەڵ مایەوە و بەمشێوەیە حەمزە ڕێگەی قوهستانی گرتەبەر.

عیسا سوپاکەی خۆی بۆ ئەوق و جوەین ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە خەوراریجی ئەو سەرزەمینەی کوشتار و دواتر ڕوویان کردە ئەوگوندانەی هاوکاری حەمزەیان دەکرد. گوندەکانیان کردە خۆراکی ئاگر و دانیشتووانەکەی کوشت تا ئەوەی گەشتە زرەنج. لەویٚ سی هەزار کەسی کوشت و گەڕایەوە. عەبدوالله کوڕی عەباسی نسفی وەك فەرمانڕەوای زرەنج دەستنیشان کرد. عەبدوالله سامانی خەڵکی وەك باج ورەدەگرت و درێژەی بەرێگەی خۆیدا. حەمزە لەئێسفراز ڕووبەڕووی بوویەوە. عەبدوالله و سوغدییەکانی هاورێی خۆڕاگرییان کرد و حەمزە شکستی خوارد. خۆی و هاوەڵە رزگار بووەکانی ڕوویان کردە ڕەزەکان. دواتر لەناو ڕەزەکان هاتنەدەر و کوشت و بڕیان دەستپێکرد و کەس بەزیندووی ڕزگاری نەبوو.

عەلی کوڕی عیسا، تاهیر کوڕی حسەینی وەك فەرمانڕەوای بوشەنج دیاریکردبوو. حەمزە مەبەستی ئەوی کرد و گەیشتە قوتابخانەیەك کەسی منالٚ وانەیان تیا دەخوێند. حەمزە منالەکان و مامۆستاکەیانی کوشت. تاهیر لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە. ئەویش هێرشی کردە سەرگوندێك کەدانیشتووانەکەی خەواریج بوون بەڵام بەشداری جەنگیان نەکردبوو. تاهیر هەموویانی کوشت و دەستی بەسەر سامانەکانیاندا گرت. تاهیر ئەوانی بەدوو دار دەبەستەوە (هەر قاچەو وبەدارێك) دواتر دارەکانی دەچەماندەوە و بەرەڵای دەکرد و بەمشێوەیە کەسی بەستراو دەبوو بەدوو کەرت. ئەو خەواریجانە نامەیەکیان بۆ حەمزە نووسی تا دەست لەکوشتار هەڵبگرێت. حەمزە دەستی لەکوشت وبڕ هەڵگرت و بەڵێنی پێدان. بەمشێوەیە ئەو دیارە ماوەیەك ئارام بوو. لەنێوان حەمزە و عەلی کوڕی عیسا چەندین جەنگ ڕوویدا.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی یەحیا کوڕی خالید بەهۆی ڕوودانی دەمارگیری لەگەڵ فەرماندەکان و سوپاییەکان ڕووی کردە شام و ئاژاوەی دامرکاندەوە و خەڵکان توانییان ڕوخساری ئاسوودەیی ببینن.

لەم ساڵەدا ڕەشید مۆری خەلافەتی لەجەعفەر وەرگرتەوە. پێشتر مۆرەکەی بەو سپاردبوو. مۆرەکەی تەسلیم بە باوکی ئەو، یەحیا کوڕی خالید کرد.

لەم ساڵەدا ڕەشید جەعفەری وەك فەرمانداری خوراسان و سەجستان دیاریکرد بەڵام دوای بیست شەو ئەوی لەسەر کار لابرد و عیسا کوڕی جەعفەری لەجێگەی ئەو دانا و جەعفەر کوڕی یەحیای وەك فەرماندەی پاسەوانەکان دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا ڕەشید دیواری موسڵی وێران کرد چوونکە عەتاف کوڕی سوفیانی ئەزی لەو شارە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە. ڕەشید سوێندی خوارد هەرکەس لەدانیشتوانی ئەوشارە ببینێت، خوێنی دەڕێژێت بەڵام باوکی یوسف فتوایدا و ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت. عەتاف موسڵی بەجێهێشت و ڕووی کردە ئەرمەنستان و لەدەستی ڕەشید دوور کەوتەوە و دواتر ڕێگەی ڕەققەی گرتەبەر و لەوێ نیشتەجێ بوو.

لەم ساڵەدا هەرسیمە کوڕی ئەعیەن لەفەرمانڕەوایەتی ئەفریقییە دوورخرایەوە و ڕەشید ئەوی بۆ بەغداد گەڕاندەوە و جەعفەر کوڕی یەحیای وەك فەرماندەی پاسەوانەکان دیاری کرد.

لەم ساڵەدا ئەرد هەژێنێکی مەترسیدار بەشێوەیەك میسری هەژاند کەگوڵدەستەی ئەسکەندەرییە داڕما.

لەم ساڵەدا حەراشەی شەیبانی لەجەزیرە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و موسلیم کوڕی بوکاری عەقیلی ئەوی کوشت.

لەم ساڵەدا مەحمەرە لەجەرجان شۆڕشی کرد. دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کەپێشەوای ئەوان عەمرۆ کوڕی محەممەدی عەمرەکی بوو. ڕەشید فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد و لەمەرو کوشتیان.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی یەحیا لەتەبەرستان و روویان لەسەر کار لابرا و عەبدوڵلە کوڕی خازم فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست. سەعید کوڕی سەلم لەجەزیرە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. جەنگی هاوینە بەفەرماندەیی محەممەد کوڕی معاویە کوڕی زوفەر کوڕی عاسم ئەنجامدرا.

لەم ساڵەدا ڕەشید بەرەو حیرە کەوتە ڕێ و لەوێ چەندین خێوەتی هەڵکرد. زەوی بەهاوەڵانی بەخشی بەڵام خەڵکی کوفە شۆڕشیان کرد ور ێزیان لەرێزی دراوسێیەتی نەگرت و ڕەشید بەناچاری بۆ بەغداد گەڕایەوە.

سەرپەرەستی حاجییەکان لەم ساڵەدا عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی بوو.

لەم ساڵەدا ڕەشید، یەحیا کوڕی سەعیدی حەرەشی وەك فەرمانداری موسڵ دەستنیشان کرد بەڵام ئەو بەشێوەیەکی خراپ لەگەڵ دانیشتوانی ئەم شارە هەڵس و کەوتی کرد و زۆربەی دانیشتوانی ئەو شارە سەرزەمینەکەی خۆیان بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا موبارەك کوڕی سەعیدی سوری برای سوفیان و سەلمەی ئەحمەر و سەعید کوڕی خەیسەم و باوکی عوبەیدە عەبد وارس کوڕی سەعیدی سەوری و عەبدولعەزیز کوڕی باوکی حازم مردن. باوکی حازم لەکاتی نوێژدا مرد. باوکی زەمورە ئەنس کوڕی عەیازیش مرد.

لەم ساڵەدا ڕەشید فەرمانیدا بناغەی شاری عەین زەربا دابرێژن و قەڵای بۆ دروست بکەن. سوپایەکی لەخوراسان و ناوچەکانی دیکەوە بۆ ئەوێ ڕەوانە کرد و ماڵی بۆ دروست کردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتای کۆچی ( ٧٩٧ زایینی )

## فەرمانڕەوای محەممەد کوڕی موقاتیل لەئەفریقییە

لەم ساڵەدا هارون ڕەشید محەممەد کوڕی موقاتیل کوڕی حەکیمی عەکی دوای لابردنی هەرسیمە کوڕی ئەعیەن – لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٧٨٣/١٧٧ زایینی ئاماژەی پێدرا– وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە دەستنیشان کرد. ئەو لەسەرەتای ڕەمەزان / ئۆکتۆبەر هاتە قەیرەوان. هەرسیمە بۆ لای ڕەشید گەڕایەوە. محەممەد برای شیری ڕەشید بوو. هەر ئەوەندەی لەئەفریقییە جێگیر بوو، هەڵس و کەوتە ناپەسەندەکانی دەست پێکرد و بەمشێوەیە سوپاکەی دژی خۆی هاندا وبڕیاریاندا مەخلەد کوڕی مورەی ئەزدی وەك فەرماندەی خۆیان دەستنیشان بکەن. سەربازەکان، بەربەرییەکان و هێزەکانی دیکە، کەژمارەیان فراوان بوو، بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد و محەممەد کوڕی موقاتیل سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد و جەنگی لەگەڵ مەخلەد دەستپێکرد و شکستی پێهێنا. مەخلەد لەمزگەوتێك خۆی شاردەوە بەڵام گرتیان و سەریان بڕی.

تەمام کوڕی تەمیمی تەمیمی لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەتونس دژی محەممەد ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و لەرەمەزانی ١٨٣/ ئۆکتۆبەری ٧٩٩ زایینی بەرەو قەیرەوان کەوتەڕێ. محەممەد کوڕی موقاتیل و سوپاکەی ڕووبەڕووی بوونەوە و لەمەنەیت ئەلخەیل کەوتنە گیانی یەك. کوڕی عەکی بۆ قەیرەوان هەڵات و تەمام شوێنی کەوت و ڕۆشتە ناو قەیرەوان. لەسەر ئەو بنەمایە ئەمانی بەکوڕی عەکیدا کە لەئەفریقییە بڕوات. کوڕی عەکی لەرەمەزان/ئۆکۆتبەر ڕووی کردە تەرابلوس.

ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و بۆ دژایەتی کردنی کردەوەکانی تەمام ڕێگەی قەیرەوانی گرتەبەر. کاتێك لەقەیرەوان نزیك کەوتەوە، تەمام ڕێگەی تونسی گرتەبەر. ئیبراهیم ڕۆشتە ناو قەیرەوان و ئەم هەواڵەی بۆ محەممەد کوڕی موقاتیل نووسی و داوای گەڕانەوەی لێکرد. محەممەد بۆ قەیرەوان گەڕایەوە و ئەمە لای خەڵکی ئەو شارە ناخۆش بوو. تەمام ئاگادار

بوویەوە و سوپایەکی رێکخست و بەگومانی ئەوەی خەڵکان محەممەدیان ناوێت و هاوکاری دەکەن، رووی کردە قەیرەوان.

کاتێک لەقەیرەوان نزیک کەوتەوە، کوڕی ئەغلەب بەمحەممەدی وت: کاتێک سوپاکەم کەم بوو، شکستی خوارد، بەڵام کاتێک گەڕایتەوە بۆ ئەم شارە، بەگومانی ئەوەی سوپا هاوکاری تۆ ناکات، ورەی بەرز بوویەوە. باشترین کار ئەوەیە لەگەڵ سوپاکەی خۆی رووبەرووی ببمەوە. ئەم کارەی کرد و بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. تەمام هەڵات و دەستەیەک لەهاوەڵانی کوژران. تەمام گەیشتە تونس و ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب شوێنی کەوت تا زیندانی بکات بەڵام تەمام داوای ئەمانی کرد و ئیبراهیم پێی بەخشی.

## فەرمانڕەوایی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب لەئەفریقییە

کاتێک بارودۆخ بۆ محەممەد کوڕی موقاتیل سەقامگیر و تەمام ملکەچی خۆی نیشاندا، خەڵکان کەبێزار و بەفەرماندەیی ئەو رازی نەبوون، ئیبراهیمیان ناچار کرد نامەیەک بۆ رەشید بنووسێت و داوای فەرمانڕەوایی ئەفریقییە بکات. میسر ساڵانە سەد هەزار دیناری بۆ ئەفریقییە دەنارد. ئیبراهیم رازی بوو نەک سەد هەزار دینارەکە وەرنەگرێت بەڵکو ساڵانە چل هەزار دیناریان بۆ بنێرێت. ڕەشید راوێژکارەکانی بانگ کرد و راوێژی پێکردن و سەبارەت بەفەرمانڕەوایەتی ئەفریقییە داوای بۆچوونی ئەوانی کرد. ئاگاداری کردنەوە کەخەڵکانی ئەفریقییە بەفەرمانڕەوایی محەممەد کوڕی موقاتیل رازی نابن. هەرسیمە فەرمانڕەوایی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەبی پشتراست کردەوە و هەموو تایبەتمەندییەکانی ئەوی لەبیرمەندی و کارزانی باس کرد بەڵام ئەم بابەتەی ئاشکرا نەکرد کەئەو ئەفریقییەی بۆ عەلی کوڕی موقاتیل پاراستووە. ڕەشید لەموحەرەم ساڵی ١٨٤/ ژانویەی ٨٠٠ زایینی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەبی وەک فەرمانڕەوایی ئەفریقییە دەستنیشان کرد و بەمشێوەیە خراپەکاری کۆچی کرد و کاروبارەکان سەقامگیر بوو. ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، تەمام و هەموو شۆڕشییەکانی بۆ لای ڕەشید ڕەوانە کرد و بەمشێوەیە ئەفریقییە ئارام بوویەوە. ئەو لەنزیک قەیرەوان بناغەی شارێکی داڕشت و بەعەباسییە ناوی برد. کەسان و هاوەڵان و کۆیلەکانی خۆی لەو شارەدا

نیشتەجێ کرد.

لەساڵی ٧٩٢/١٨٦ زاییینی پیاوێك لەعەرەبەکانی سەرزەمینی تونس بەناوی حەمدییس، شۆڕشی کرد و ڕەشی کەنیشانەی عەباسییەکان بوو، خستە لاوە. شوێنکەوتەکانی فراوان بوون و کوڕی ئەغلەب، عیمران کوڕی مەخلەدی لەگەڵ سوپایەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد و فەرمانی پێدا ئەگەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کەسیان بەزیندووی نەهێڵێتەوە. عیمران بەڕێکەوت و لەبەرابەر یەك سوپایان ڕازاندەوە. هاوەڵانی حەمدیس هاواریان کرد: بەغداد، بەغداد (ئەوانی بۆ گرتنی بەغداد هاندەدا) بەڵام هەورە بروسکەی شمشێر گیانی گرتن و دەهەزار کەسیان لێکوژرا و عیمران ڕۆشتە ناو تونس.

ماوەیەك دواتر کوڕی ئەغلەب ئاگادار بوویەوە ئیدریس کوڕی ئیدریسی عەلەوی لەکەنارەکانی ڕۆژئاوا ئالای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە و هێزی زیادی کردووە. ئەغلەب مەبەستی جەنگی ئیدریسی کرد بەڵام کەسانی نزیکی ڕێگەی ئەم کارەیان لێگرت و پێشنیارییان کرد تا ئەو کاتەی دژایەتی لەگەڵ تۆ ئاشکرا نەکردووە، دژایەتی نەکەیت. ئەغلەب ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و نامەیەکی بۆ بەهلول کوڕی عەبدواحید کارگوزاری ئیدریس لەمەغریب نامەیەکی نووسی و چەندین دیاری گرانبایی بۆ نارد. ئەو کەبەردەوام هاوڕێیەتی ئیدریسی دەکرد، ملکەچی فەرمانەکانی ئیبراهیم بوو و ئیدریسی پشتگوێ خست و بەمشێوەیە دەستەکەی ئیدریس وردە وردە بڵاوەیان لێدەکرد. بەهلول نامەیەکی بۆ ئەغلەب نووسی و داوای لێکرد دەست لەئیدریس هەڵبگرێت و خزمایەتی ئەوی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) بیرهێنایەوە. کوڕی ئەغلەب لێی خۆش بوو.

عیمران کوڕی مەخلەد – پێشتر ناوی برا – لەکەسە نزیکەکانی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب و و لەکۆشکەکەی ئەو دەژیا. ڕۆژێك سوار لەسەر ئەسپ هاوڕێیەتی ئیبراهیمی دەکرد و گفتوگۆیان دەکرد بەڵام ئیبراهیم چوونکە بیری لەبابەتێکی دیکە دەکردەوە، گرنگی بەوتەکانی عیمران نەدەدا و داوای لێکرد دووبارەی بکاتەوە. ئەمە بووە هۆی تووڕە بوونی عیمران و لێی جیابوویەوە و دەستەیەکی گەورەی پێکهێنا و دژی ئیبراهیم شۆڕشی کرد. ئەو سوپاکەی خۆی لەنێوان

قەیرەوان و عەباسییە رازاندەوە. خەڵکانی قەیرەوان و زۆرینەی دانیشتووانی ئەفریقییە هاوکارییان کرد. ئیبراهیم لەدەوری عەباسییە خەندەکێکی هەڵکەند و هاتوچۆ کردن بۆ ناو شاری دژوار کرد. جەنگی نێوان ئەم دووانە یەك ساڵ درێژەی کێشا. هارون ڕەشید ئاگادار بوویەوە. سامانێکی زۆری بۆ ئیبراهیم نارد و کاتێك سامانەکەی بەدەست گەیشت، فەرمانیدا جاڕ بدەن: هەرکەس خۆی بەیەکێك لەسوپاکەی سەروەری باوەڕداران دەزانێت، بابێت دیاری خۆی وەربگرێت. بەمشێوەیە هاوەڵانی عیمران بڵاوەیان لێکرد و هێزەکانی ئیبراهیم هێرشیان کردە سەر و شکستیان پێ هێنان. ئیبراهیم بانگی ئەمانی بەرز کردەوە و رایگەیاند هەر کەس بێت، دیاری وەردەگرێت. هەموویان هاتن و دیاری بەهەموویاندا و دەروازەکانی قەیرەوانی هەڵکەند و دیوارەکەی وێران کرد.

عیمران ملی رێگەی گرتەبەر و گەیشتە زاب و لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی ئیبراهیم مرد و کوڕەکەی هاتە سەر تەخت و ئەمانی بەعیمران بەخشی. عیمران هاتە لای و لەنزیك ئەوماڵێکی بۆ خۆی دروست کرد. کەسانی نزیك بەردەوام بەگوێی عەبدوالله( جێگری ئیبراهیم) دەیانچرپاند ئەو دژی باوکی تۆ شۆڕشی کرد و ئێمە لێی دڵنیا نین. عەبدوالله کوشتی.

کاتێك عیمران شکستی خوارد، هەوری خراپەکاری ئاسمانی ئەفریقییە بەجێهێشت و بەمشێوە مایەوە تا ئیبراهیم مرد. ئەو لەشەواڵی ساڵی ١٩٦/ ژوئەنی ٨١٢ مرد. تەمەنی پەنجا و شەش ساڵ درێژەی کێشا و بۆ ماوەی دوانزە ساڵ و چوار مانگ و دە رۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## فەرمانڕەوایی عەبدوالله کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب لەئەفریقییە

کاتێك ئیبراهیم مرد، عەبدوڵلای کوڕی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت کە لەو کاتەدا لەتەرابلوسی بەربەرەکان – وەك لەگێرانەوەی رووداوەکانی ساڵی ١٩٦/ ٨٠٢ زایینی ئاماژەی پێدەدەین– گەمارۆیان خستبووە سەر. ئیبراهیم عەبدوڵلای وەك جێگری خۆی دیاریکرد و فەرمانی بەزیاد الله کوڕی ئیبراهیم دا دەستی بەیعەت بخاتە ناو دەستی براکەی. ئەو بەیعەتی کرد و کاتێك باوکی مرد، هەواڵی مەرگی باوك و بەیعەتی خۆی بۆ نووسی. عەبدوالله تەرابلوسی بەجێهێشت

و هاتە قەیرەوان. بەمشێوەیە کاروبارەکان سامان دران و لەو ڕۆژگارەدا هیچ ئاریشەیەك ڕووی نەدا و دەرگای هیچ جەنگێك نەکرایەوە. زۆربەی خەڵکان لەناو جێگەی ئارامیدا حەوانەوە و شارەکان گۆی ئاوەدانییان فڕاند. عەبدوالله لەزیحەجچە ٢٠١/٨١٧ زایینی کۆچی دوایی کرد.

## ناسازگاری خەڵکانی ئاندۆلۆس و پاشاکەی

لەم ساڵەدا بەهلول کوڕی مەرزوق ناسراو بەباوکی حەجاج لەکەنارەکانی سەرزەمینی ئاندۆلۆس ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە و هاتە ناو ساراگوزا و دەستی بەسەردا گرت. عەبدوالله کوڕی عەبدولرەحمان پاشای ئاندۆلۆس ناسراو بەبەلەنسی کەمەبەستی فەرەنگی بوو، پەیوەستی بەهلول بوو.

عوبەیدە کوڕی حومەید لەتۆڵدۆ ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە و پاشای ئاندۆلۆس فەرمانی بەعەمروس کوڕی یوسف دا (کە لەتەلبیرە ،تالاورا) بۆ جەنگی خەڵکانی تۆڵدۆ بڕوات. ئەو، چەندین جار ڕووبەڕوویان بوویەوە و تەنگی پێ هەڵچنین. نامەیەکی بۆ خەڵکانی تۆڵدۆ نووسی کە بەمناڵەکانی مەخشی ناسراو بوون. لەنامەکاندا بەئەندازەیەك خۆشەویستی خۆی دەربڕی کەکاریگەری لەسەر دڵیان بەجێهێشت و لەبەر ئەمە هێرشیان کردە سەر عوبەیدە کوڕی حومەید و دەستبەجێ کوشتیان و سەری بڕاوی ئەویان بۆ عەمروس نارد. ئەویش سەرە بڕاوەکەی بۆ بارەگای پاشای ئاندۆلۆس ڕەوانە کرد و پێگەی مناڵەکانی مەخشی لای ئەو بەرز کردەوە. مناڵەکانی مەخشی لەگەڵ بەربەرەکانی شاری تالاورا ناسازگار بوون و لەبەر ئەمە سات ناسات بەسەر بورج و دیواری ئەواندا سەردەکەوتن و خوێنیان دەڕشتن. عەمرۆس لەگەڵ سەری بڕاوی عوبەیدە حەوت سەد کەس لەبەربەرەکانی بۆ بارەگای پاشای ئاندۆلۆس برد کەهەرکامیان دەبردە سوچێك و خوێنیان دەڕشتن. بەمشێوەیە بارودۆخی ئەو دیارە هێور بوویەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا هارون ڕەشید لەسەرزەمینی ڕۆم جەنگا و دەستی بەسەر قەڵای سەفسافدا گرت.

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی ساڵح لەسەرزەمینی ڕۆم جەنگا و خۆی گەیاندە

ئانکارا و مەتمورەی گرت و حەمزە کوڕی مالك لەوێ مرد.

لەم ساڵەدا سور پۆشەکان دەستیان بەسەر خوارساندا گرت.

لەم ساڵەدا هارون رەشید سلاو بۆ پێغەمبەری کردە دەسپێکی نامەکان. سەرپەرەستی حاجییەکان لەم ساڵەدا ڕەشید بوو.

لەم ساڵەدا دانی سوربەکان لەنێوان موسوڵمانان و رۆمییەکان بوو بەنەریت و ئەمە یەکەمین سوربەکان لەرۆژگاری مناڵەکانی عەباس بوو. قاسم کوڕی ڕەشید وەك جێبەجێکاری ئەم نەریتە دەستنیشان کرا. ئیمپراتۆری رۆم لەم ساڵەدا نەقفور (نیکفۆروس) بوو.

خەڵك لەگۆڕینەوەی ئەسیرەکان شادمان بوون و هەموو زیندانییە رۆمییەکان ئازاد کران. ئەم ئاڵ و گۆڕە لەلامس لەکەنار زەریایەك روویدەدا کەدوورییەکەی لەتەرسوس دوانزە فەرسەنگ بوو. سی هەزار موچەخۆر هاورێیەتی باوکی سلێمانیان دەکرد. خزمەتکاری کارگوزاری تەرسوس هاورێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەسنور نشینەکان و بیرمەندان و کەسە دیارەکان بۆ ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان هاتن. ژمارەی ئەسیرەکان سێ هەزار و حەوتسەد کەس بوو. ئاماژەیان بەژمارەی زیاتریش داوە.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی قەحتەبە کەخۆی و باوکی لەفەرماندەکانی مەنسور بوون، لەتەمەنی سی و چوار ساڵی مرد.

هەروەها عەبدوالله کوڕی موبارەکی مەروزی لەمانگی رەمەزان/ ئۆکتۆبەر لەهیت لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی و عەلی کوڕی حەمزە باوکی حەسەنی ئەزدی ناسراو بە کەسایی موقری و نەحوی لەشاری ڕەی مردن. دەستەیەك مەرگی کەسای بۆ ساڵی ٧٨٩/١٨٣ زایینی دەگێڕنەوە.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی سلێمان کوڕی یەحیا کوڕی باوکی حەفسەی شاعیر مرد. ئەو لەساڵی ٧١١/١٠٥ زایین چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی یوسفی قازی بەناوی یەعقوب کوڕی ئیبراهیم، گەورەترین شاگرد و شوێنکەوتەی باوکی حەنیفە، مرد.

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی داود کوڕی عومەر کوڕی تەهمان موالی عەبدوالله کوڕی خازمی سولەمی مرد. ئەو وەزیری مەهدی بوو. هاشم کوڕی بەرید یەزید کوڕی زورەیع و حەفس کوڕی مەیسەرەی سەنعانی لەسەنعای دیمەشق، هەموویان مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و دووی کۆچی ( ٧٨٩ )

لەم ساڵەدا ڕەشید بۆ خەلافەتی عەبدوالله مەئمون دوای ئەمین بەیعەتی وەرگرت. ئەوی کردە فەرمانڕەوای خوراسان و سەرزەمینەکانی پەیوەست بەخوراسان تا هەمەدان و جەعفەر کوڕی یەحیای وەك ڕاوێژکاری ئەو دیاری کرد.

ئەمە یەکێکە لەسەرسوڕهێنەکان: ڕەشید بەچاوی خۆی بینی باوك و باوەگەوریی ئەو مەنسور لەگەڵ عیسا کوڕی موسا چی کرد و بەناچاری دەستی لەخەلافەت هەڵگرت و هادی برای ئەگەر نەدەمرد، نەیدەهێشت ڕەشید خەلافەت بگرێتە دەست و لەگەڵ ئەمەیشدا بۆ مەئمون دوای ئەمین بەیعەتی وەرگرت. بەڵێ، خۆشەویستی سەرکێش، هەم چاو لەمرۆڤ دەستێنێت هەم گوێ.

لەم ساڵەدا کچی خاقان پاشای خەزەر بۆ هاوسەری فەزڵ کوڕی یەحیا ڕەوانە کرا بەڵام لەبەرزەعە مرد. کەسانی نزیکی ئەو بۆ لای خاقان گەڕانەوە و ئاگاداریان کردەوە کچەکەی بەفریو کوژراوە. پاشا بۆ هێرش کردنە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان سوپای ئامادە کرد.

جەنگی هاوینە بەفەرماندەیی عەبدولرەحمان کوڕی عەبدولمەلیك ئەنجامدرا و گەیشتە ئێفسوس و شارەکانی نزیکی ئەو شارە.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان چرای دوو چاوی فەرمانڕەواکەی خۆیان کۆنستانتین کوڕی ئەلیونیان کوژاندەوە و دایکی ئەویان هێنایە سەرتەخت و نازناوی (عطسە)یان پێبەخشی.[٦]

سەرپەرەستی حاجییەکان لەم ساڵەدا موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا بوو. هەرسیمە کوڕی ئەعیەن فەرمانڕەوایی موسڵی دەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس، لەڕۆژهەڵاتی ئاندۆلۆسەوە سوپایەکی ڕازاندەوە وبۆ جەنگی برازاکەی حەکەم کوڕی هوشام کوڕی عەبدولرەحمان، پاشای ئەو دیارە بەرێکەوت. حەکەمیش

---

[٦] لەمێژووی تەبەری بە (اغسطە) ناوی براوە.

بەسوپایەکی گەورە رووبەرووی بوویەوە. ژمارەیەکی فراوان لەخراپەکاران وئاژاوەگێران لەدەروی سلێمان کۆببونەوە و هاوکارییان دەکرد. هەردوو سوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەست و هێرشیان کردە سەریەك. جەنگ، دژوار و سلێمان شکستی خوارد و سوپاکەی حەکەم شوێنی کەوت. جەنگی نێوانیان لەزی حەجحە/ژانویە سەر لەنوێ دەستی پێکردەوە و دووبارە سلێمان شکستی خوارد و پەنای بردە بەکوێستانەکان و بەردەلانە دژوارەکان و چیتر حەکەم دەستی لەشوێنکەوتنی ئەو هەڵگرت.

سلێمان جارێکی دیکە گەڕایەوە و بەربەرەکانی کۆکردەوە و رووی کردە ئەستجە (ئەسیجا). حەکەم بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوت و لەساڵی ١٨٣/ ٧٩٩ دوو سوپا کەوتنە گیانی یەك و ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند و سلێمانی تێکشکاو گەڕایەوە و لەگوندێك پەنای گرت. حەکەم دەوری گوندەکەی گرت و سلێمان بۆ دیاری فێریش هەڵات.

لەم ساڵەدا لافاوێکی گەورە لەکوردوبا زەوی شۆردەوە و زۆربەی ماڵەکانی ئەو سەرزەمینەی بردە ژێر ئاو و وێرانی کرد و داوێنەکەی گەیشتە شەقندە (سکۆندا)

لەم ساڵەدا جەعفەری تەیالسی حەدیس بێژ و عومار کوڕی محەممەد خوشکەزای سوفیانی سەوری و عەبدعەزیز کوڕی محەممەد کوڕی باوکی عوبەید دراوەردی موالی جۆهەینە کەباوکی خەڵکی دارابگەرد بوو، مردن. خەڵکی دارابگەرد ئەم خزمایەتییەیان پەسەند نەدەکرد و لەبەر ئەمە بەدراوەردی ناویان دەبرد.

هەروەها لەم ساڵەدا دوراج باوکی سەمح کەناوی عەبدوالله کوڕی سەمح یا بەگومانێك عەبدولرەحمان کوڕی سەمح کوڕی ئوسامەی تەجیبی میسری بوو، کۆچی دوایی کرد. ساڵی لەدایك بوونی ئەو ١٢٥/ ٧٤٢ زایینییە. عەفیف کوڕی سالمی موسڵی لەم ساڵەدا چاوی لەجیهان بەست.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و سێی کۆچی (٧٩٩) زاینی

### لەشکرکێشی خەڵکانی خەزەر بۆ سەرزەمینە ئیسلامییەکان

لەم ساڵەدا خەڵکانی خەزەر بەبیانوی مردنی کچی خاقان لەباب الابواب سوپایان کردە سەر موسوڵمانان و خوێنی ئەمان بەخشراوەکان (ئەهلی زەممەیان) ڕشت و زیاتر لەسەد هەزار کەسیان دیل کرد. ڕەشید، یەزید کوڕی مەزیدی وەك فەرمانڕەوایی ئەرمەنستان و ئازەربایەجان دیاری و بۆ جەنگی خەزەرییەکان ڕەوانەی کرد. خەزیمە کوڕی خازمی لەنەسیبین جێگیر کرد تا ڕێگری بکات لەهێرشی ئەرمەنییەکان.

دەگێڕنەوە هۆکاری هێرشی ئەوان ئەمە بوو: سەعید کوڕی سەلم، ئەستێرەناسێکی سولەمی کوشت و منالی ئەستێرەناسەکە ڕۆشتە سەرزەمینی خەزەر و ئەوانی دژی سەعید هاندا. ئەوانیش ئالأی شۆڕشیان بەرز کردەوە و لەڕێگەی سولمەوە ڕۆشتنە ناو ئەرمەنستان و سەعیدیان کوشت و نزیکەی حەفتا ڕۆژ لەوێ مانەوە. ڕەشید خوزەیمە کوڕی خازم و یەزید کوڕی مەزیدی ڕەوانە کرد و ئەوان کارە چەوتەکانی سەعیدیان ڕاست کردەوە و خەزەرییەکانیان دەرکرد و کەنارەکانی سولمەیان بەست.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ڕەشید، عەلی کوڕی عیسای لەخوراسان بانگ کردەوە و دواتر بەنوێنەرایەتی مەئمونی کوڕی ئەوی بۆ خوراسان گەڕاندەوە و فەرمانی پێدا لەگەڵ باوکی خەسیب بجەنگێت.

لەم ساڵەدا باوکی خەسیب کەناوی وەهەیب کوڕی عەبدوالله نەسائییە، لە (نەسا)ی خوراسان ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە.

عەباس کوڕی هادی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەغداد و لەزیندانی ڕەشید مرد.

هۆکاری زیندانی کرانی ئەمە بوو: ڕەشید لەڕەمەزانی ساڵی ١٧٩/ نۆڤەمبەری ٧٩٦ زایینی حەجی عەمرەی کرد. کاتێك گەڕایەوە بۆ لای دانیشتووانی مەدینە، ڕۆشتە سەر ئارامگای پێغەمبەر (د.خ) و لەگەڵ هاوڕێکانی زیارەتیان کرد. کاتێك ڕۆشتە ناو ئارامگای پێغەمبەر(د.خ)، وەستا و وتی: سلاو لەتۆی ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی کوڕە مام! تا بەمشێوەیە شانازی بەسەر کەسانی دەوروبەری خۆی بکات. موسا کوڕی جەعفەر هاتە پێش، ڕووی کردە ئارامگای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: سلاو لەتۆ ئەی باوکە! ڕەنگ لەڕوخساری ڕەشید پەڕی و ڕووی کردە موسا کوڕی جەعفەر و وتی: ئەمەیە شانازی کردنی ڕاستەقینە. دواتر ئەوی لەگەڵ خۆی بۆ عێراق برد و لای سندی کوڕی شاهەك زیندانی کرد. خوشکی سندی کوڕی شاهەك کاروباری زیندانی کردنی ئەوی گرتەدەست. خوشکی سندی سەبارەت بەموسا کوڕی جەعفەر دەگێڕێتەوە کاتێك دەیویست نوێژی خەوتنان بکات، وەسفی خوای دەکرد و بەردەوام ناوی ئەوی دەهێنایە سەرزمان تا شەو بەسەر دەچوو، تا نوێژی بەیانی دەپارایەوە، دواتر نوێژی بەیانی دەخوێند و تا بەرەبەیان لەپارانەوە و ڕاز و نیاز بەردەوام دەبوو، ئەوسا دەخەوت و نزیك نیمەڕۆ لەخەو هەڵدەستا، دەستنوێژی دەگرت و نوێژی دەخوێند و بەردەوام دەبوو تا نوێژی خەوتنان. عادەتی بەمشێوە بوو تا ئەو کاتەی خواوەند گیانی گەڕاندەوە بۆ لای خۆی.

خوشکی سندی کاتێك ئەوی دەبینی، دەیوت: زیانیان کرد ئەو دەستەی دەستیان بۆ سەر ئەم پیاوە چاکەکارە درێژ کرد. نازناوی موسا کوڕی جەعفەر، کازمە. چوونکە هەرکەس خراپەی لەگەڵ دەکرد، بەچاکە وەڵامی دەدایەوە. ئەو کاتەی لەزینداندا بوو، نامەیەکی بۆ ڕەشید نووسی: ڕۆژێك دژوار و سەخت لای من تێپەڕ نابێت مەگەر ئەوەی تۆ ئەو ڕۆژە بەئاسوودەیی بەسەر ببەیت تا ئەوەی ئەم دوو ڕۆژە بەسەر دەچێت و ڕۆژێك دەگات کەچیتر بەسەر ناچێت. ئەمە ئەو

ڕۆژەیە خراپەکاران زیانی تیا دەبینن.

لەم ساڵەدا لەنێوان فەرماندەیەکی گەورە بەناوی باوکی عیمران و بەهلول کوڕی مەزروق لەکەسە دیارەکانی ئاندۆلۆس، شەڕێکی قورس و دژوار ڕوویدا. عەبدوالله بەلەنسی هاوڕێیەتی باوکی عیمرانی دەکرد. هاوەڵانی بەهلول شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران.

هەروەها لەم ساڵەدا یونس کوڕی حەبیبی نەحوی، مرد. ئەو زانستەکەی خۆی لای باوکی عەمرۆ کوڕی عەلا فێر ببوو. زیاتر لەسەد ساڵ ژیا.

لەم ساڵەدا موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس و محەممەد کوڕی سەبیح باوکی عەباس ناسراو بەکوڕی سەماك و هوشەیم کوڕی بەشیری واستی مردن. هوشەیم لەمانگی شەعبان/ سێپتامبەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هەرچەندە راوێژکار بوو بەڵام ئاڵ و گۆڕی بەقسەکان دەکرد. یەحیا کوڕی زەکەریا کوڕی باوکی زائیدە، قازی مەداین لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی و یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی عەبدوالله کوڕی باوکی سەلمە ماجشون، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و چواری کۆچی ( ٨٠٠ زایینی )

لەم ساڵەدا ڕەشید، حیمادی بەربەری وەك فەرمانڕەوای یەمەن و مەککە دەستنیشان کرد و داود کوڕی یەزید کوڕی حاتەمی موهەلبی وەك فەرمانڕەوای سند و یەحیا حەرەشی وەك فەرمانڕەوای کێوەکان و مەهرویەی رازی وەك فەرمانڕەوای تەبەرستان دەستنیشان کرد. ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب کاروبارەکانی تایبەت بەئەفریقییەی بەرێوەدەبرد و ڕەشید ئەوی لەسەر کارەکەی هێشتەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عەمرۆی شاری ئالاّی شۆڕشی بەرز کردەوە. هارون، زوهەیری قەسابی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و توانی لەشاری وەرز خوێنی باوکی عەمرۆ بڕێژێت.

لەم ساڵەدا باوکی خەسیب داوای ئەمانی کرد و عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان ئەمانی پێبەخشی.

ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەبدواللە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. یەزید کوڕی مەزید کوڕی زائیدەی شەیبانی فەرمانڕەوایەتی موسڵ و ناوچەکانی دەوروبەری دەکرد.

لەم ساڵەدا عەبدواللە کوڕی عەبدولرەحمانی بەلەنسی ڕوویکردە ئەشیقە لەشارەکانی ئاندۆلۆس و لەگەڵ باوکی عیمران و عەرەبەکانی دیکە لەو شارە دابەزی. بەهلولی مەرزوق بۆ سەرکوت کردنی ئەوان ڕەوانە کرا و گەمارۆی خستنەسەر. عەرەبەکان ئەو شارەیان بەجێهێشت و بەهلول ڕۆشتە ناو شاری ئەشیقە و عەبدواللە ڕێگەی والنسیای گرتەبەر و لەوێ نیشتەجێ بوو.

لەم ساڵەدا مەعاف کوڕی عیمرانی موسڵی ئەزدی لەتەمەنی هەشتا و پێنج ساڵی کۆچی دوایی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدواللە کوڕی عەبدعەزیز کوڕی عومەر کوڕی خەتاب کە بەعابید ناویان دەبرد، مرد. عەبدسەلام کوڕی شوعەیب کوڕی حەبحابی ئەزدی و عەبد ئەعلی کوڕی عەبدواللەی شامی میسری لەمناڵەکانی شامە کوڕی لوئەی و عەبدوەهاب کوڕی عەبد مەجیدی سەقەفی باوکی محەممەد، هەموویان کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و پێنجی کۆچی ( ٨٠١ زایینی )

لەم ساڵەدا خەڵکی تەبەرستان، خوێنی فەرمانڕەواکەی خۆیان مەهرویەی ڕازییان ڕشت. ڕەشید عەبدواللە کوڕی سەعیدی حەرەشی لەجێگەی ئەو دانا.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئەنبار، ئەبان کوڕی قەحتەبەی خارجی لەمەرج قەلعە کوشت.

لەم ساڵەدا حەمزەی خارجی لەبادغەیس خراپەکاری کردە پیشە، عیسا کوڕی عەلی کوڕی عیسا دەهەزار کەس لەهاوەڵانی ئەوی کوشت و گەیشتە کابول و زابولستان.

لەم ساڵەدا باوکی خەسیب دووبارە ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و دەستی بەسەر ئەبیوەرد، توس و نەیشابوردا گرت. گەمارۆی خستە سەر شاری مەرو، بەڵام دواتر پاشەکشێی کرد وبۆ سەرەخس گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی یەحیا داوای مۆڵەتی مانەوەی لەمەککە کرد و مۆڵەتیان پێدا. ئەو لەشەعبان/ئوت ڕۆشت و لەرەمەزان/سێپتامبەر حەجی عەمرەی بەجێهێنا و لەجەدە نیشتەجێ بوو تا کاتی حەج و حەجی کرد.

لەم ساڵەدا حەکەم پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی ڕازاندەوە و هێرشی کردە سەرمامەکەی، سلێمان کوڕی عەبدولرەحمان لەکەنارەکانی فێریش و ڕووبەڕووی بوویەوە. سلێمان پاشەکشێی کرد و ڕووی کردە ماردە. دەستەیەك لەسوپاکەی حەکەم شوێنی کەوتن و زیندانییان کرد. ئەوان گەڕانەوە بۆ بارەگای حەکەم و حەکەم فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد و سەریان لەجەستە جیا کردەوە و فەرمانیدا بۆ کوردوبای بنێرن. ئەو ئەمان نامەی بۆ مناڵەکانی سلێمان لەساراگوزا نارد و بۆ لای خۆی بانگێشتی کردن. مناڵەکانی سلێمان ڕێگەی کوردوبایان گرتەبەر.

لەم ساڵەدا هەورە بروسکە لەمزگەوتی حەرامیدا و دوو کەسی کوشت. مەنسور کوڕی محەممەد کوڕی عەبدواللە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەبدسەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس مرد. بەدرێژایی تەمەنی ددانی نەکەوت. دەگێڕنەوە ددانەکان سەرەوەی پەیوەست هاوشێوەی ددانەکانی خوارەوەی. ئەو نەبیرەی (مناڵی نەوە، نەتیجە) مناڵەکانی مەنافە. لەهاوشێوەی بۆ عەبدمەناف وەك یەزید بۆ معاویە بوو. عەبد سەمەد دوای سەد و بیست ساڵ لەمردنی یەزید، مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا فەرەنگییەکان شاری بارەسەلۆن لەئاندۆلۆسیان گرت و موسوڵمانەکانیان دەرکرد و سنووردارەکانی خۆیان بۆ ئەو شارە گواستەوە و موسوڵمانان بەناچاری پاشەکشێیان کرد.

چۆنیەتی گرتنی بارەسەلۆن بەمشێوەیە: حەکەم فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ دوو مامەکەی بوو.

لەم ساڵەدا ڕەشید لەڕەققەوە بەگوزەر کردن لەموسڵ هاتە بەغداد.

لەم ساڵەدا یەقتین کوڕی موسا لەبەغداد مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا یەزید کوڕی مەزید کوڕی زائیدەی شەیبانی، برازای مەعن کوڕی زائیدە لەشاری بەرزعە مرد و ئەسەد کوڕی یەزید جێگەی ئەوی گرتەوە. زۆر وەسفی یەزیدیان کردووە. ئەو بەخشەر، بوێر و جوامێر بوو. شاعیرەکان بۆ مەرگی ئەو زیاترین پرسەنامەیان هۆنیوەتەوە. باشترین پرسەنامە تایبەتە بەباوکی محەممەدی تەمیمی. باشترە ئاماژەی پێ بدرێت:

احقا انه اودى يزيد    تبين ايها الناعى المشيد
اتدرى من نعيت و كيف فاهت    به شفتاك كان بها الصعيد
ابعد يزيد تختزن البواكى    دموعا، او يصان لها خدود
لتبكك قبة الاسلام لما    وهت أطنابها و وهى العمود
و يبكك شاعر لم يبق دهر    له نسبا و قد كسد القصيد
فمن يدعو الامام لكل خطب    ينوب و كل معضلة تؤود
و من يحمى الخميس اذا تعايا    فريس للمنية أو طريد
ألم تعجب له! ان المنايا    فتكن به و هن له جنود

قصدن له و كن يحدن عنه — اذا ما الحرب شب لها وقود
أحامى المجد و الاسلام أودى — دعائمه و هل شاب الوليد
وهل مالت سيوف بنى نزار — وهل وضعت و هل يخضر عود
أما هدت لمصرعه نزار — بلى! و تقوض المجد و المشيد
و حل ضريحه اذ حل فيه — طريف المجد و الحسب التليد
اما والله ما تنفك عينى — عليك بدمعها ابدأ تجود
فان تجمد دموع لئيم قوم — فليس لدمع ذى حسب جمود
لقد عزى ربيعة ان يوما — عليها مثل يومك لا يعود

واتاکەی: ئایا راستە یەزید لەخاکدا خەتووە؟ کەواتە ئەی هەواڵ بەری مەرگ، درەنگ بکە. ئایا دەزانی هەواڵی مەرگی کێ دەدەیت و چۆن لێو دەکەیتەوە؟ قوڕ بەدەمت بێت. ئایا پاسەوانی رێزداری و ئیسلام چاوی لێك ناوە؟ هاوار لەتۆ، زەوی بۆ سەرەوژێر نابێت؟ چاوەرێ بە و بڕوانە پایەکانی ئیسلام خوار بووە و زارۆك لەتاو پیری پشتی چەماوەتەوە. ئایا شمشێری منالەکانی نزار، لەدەست کەوتۆتە خوار و زین لەپشتی ئەسپەکان داگیراوە؟ ئایا دوای مەرگی ئەو سەرزەمینی ئێمە بەبارینی باران تێراو دەبێت و لق و گەڵاکان سەر دەردێنن؟ ئایا هۆزی نزار لەمەرگی ئەو سست و ناتەوان بوو؟ بەڵێ، گەورەیی سەر بۆ ئاسمان کێشراو وێران بووە. لەو کاتەوەی ئەو لەناو گۆڕدا خەوت، رێزداری و نەژادی ڕەسەن لەوێ حەوایەوە. سوێند بەخوا، بەردەوام بۆ مەرگی تۆ فرمێسك لەچاو دەبارێنم و بەردەوام ئاو لەچاوم دەگێڕم. ئەگەر فرمێسکی دەستەیەکی پەست وشك ببێت، فرمێسکی خاوەن نەژادەکان بەردەوام لەچاو دێتەخوار. ئایا دوای یەزید چاو بەگریانان دەتوانن فرمێسك پاشەکەوت بکەن و چیتر شەقەزللە لەروخسار نەدەن. گوڵدەستەی ئیسلام دەبێت فرمێسك بۆ تۆ برێژێت و تەنافەکانی بپچڕێت و پایەکانی سست ببێت. شاعیرێك کەرۆژگار ناوی دەسرێتەوە، دەبێت فرمێسك بۆ تۆ ببارێنێت چوونکە بازاری شاعیری برەوی نەماوە. خەلیفە لەکاتی پێشهاتنی دژوارییەکان و سەختییەکان راوێژ لەگەڵ کێ بکات و کێ بۆ دەرگای خۆی بانگ

بکات؟ چ کەسێك دەتوانێت لەکاتی لێقەومانی سوپا، ڕێگە چارەیان بۆ بدۆزێتەوە؟ ئەگەر یەزید کۆچی کرد، هەر زیندوویێك، هەڵاتوو دەبێتە نێچیری مەرگ. ئایا سەرت سوڕنامێنێت مەرگ بەسەر ئەودا زاڵ دەبێت لەکاتێکدا مەرگ یەکێکە لەسوپاییەکان و فەرمانبەرانی ئەو؟ ئەو مەرگە مەبەستی گیانی ئەوی کرد کە لەکاتی بڵێسە سەندنی جەنگ، لێی دوور دەکەوتەوە. ئەوەی خەمی مناڵەکانی ڕەبیعە کەم دەکاتەوە، ئەوەیە چیتر ڕۆژێکی لەو شێوە ناگەڕێتەوە (چوونکە کەسێکی هاوشێوەی تۆ لەناو ئێمەدا نییە.)

ڕەشید کاتێك ئەم پرسە نامەی بیست، فرمێسك لەچاوی هاتەخوار و بەهۆنراوەیەکی جوانی لەقەڵەمدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ئیمام کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس لەبەغداد و عەبدوالله کوڕی مەسعەب کوڕی سابت کوڕی عەبدوالله کوڕی زوبەیر و موغەیرە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی عەیاشی مەخزومی کە بەحەزامی ناودەبرا و لەساڵی ١٢٤/ ٧٤١ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو، مردن. هەروەها حەجاجی سەواف کوڕی باوکی عوسمانی مەیسرە لەم ساڵەدا مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتای کۆچی ( ٨٠٢ زایینی )

**هاوپەیمانی حەکەم پاشای ئاندۆلۆس لەگەڵ عەبدوڵڵەی مامی**

لەم ساڵەدا حەکەم کوڕی هوشام کوڕی عەبدوڵڵە پاشای ئاندۆلۆس، لەگەڵ مامیی، عەبدوڵڵە کوڕی عەبدولرەحمانی بەلەنسی، پەیمانی بەست.

هۆکاری ئەم پەیمانە ئەوە بوو: عەبدوڵڵە هەواڵی مەرگی براکەی بیست و بۆ گیانی خۆی ترسا. لەوالنسیا نەڕۆشتەدەر و ئاڵای شۆڕشی بەرز نەکردەوە و کەسێکی بۆ دەرگای حەکەم نارد و پێشنیاری ئاشتی و گوێرایەڵی پێکرد. دەستەیەك دەڵێن: حەکەم کەسێکی بۆ لای عەبدوڵڵە ڕەوانە کرد وپێشنیاری ئاشتی و سازانی پێدا. سامانێکی فراوانی بۆ خۆی و کوڕەکەی نارد و عەبدوڵڵە ڕازی بوو. ئەم پەیمانە لەسەر دەستی یەحیا کوڕی یەحیا هاوڕێی مالك برای ئەنس و دەستەیەکی دیکە لەفرەزانەکان بەسترا و بەهێز بوو. حەکەم خوشکەکانی کردە هاوسەری کوڕەکانی عەبدوڵڵە. عەبدوڵڵە هاتە بارەگاکەی. حەکەم ڕێزی لێگرت و پێگەی بەرز کردەوە و بۆ خۆی و مناڵەکانی ڕۆژانەیەکی بەرچاو و پاداشی فراوانی دیاریکرد.

دەگێڕنەوە: نامەکان بۆ ڕێککەوتن و سازان لەم ساڵەدا بووە بەڵام لەساڵی ٨٠٣/١٨٧ زایینی ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر کرا.

## حەجی ڕەشید و دیاریکردنی خەلیفەی دوای خۆی

لەم ساڵەدا هارون لەگەڵ خەڵکان ڕێ و ڕەسمی حەجی ئەنجامدا و لەئەنبارەوە ڕووی کردە مەککە. سەرەتا ڕۆشتە مەدینە. لەو شارە سێ جار دیاری بەخەڵکان درا. یەکیان دیارییەکانی خۆی وەك خەلیفە، یەکیتر دیارییەکانی محەممەد ئەمین و سێیەم دیارییەکانی عەبدوڵڵە مەئمون. کاتێك گەیشتە مەککە، دیاری لەناو خەڵکانی ئەو شارەیش دابەش کرد. لەسەر یەك هەزار هەزار و پەنجا هەزاری کردە دیاری و پێشکەشی.

ڕەشید ئەمینی وەك فەرمانڕەوای عێراق، شام تا کۆتایی ڕۆژئاوا دیاری کرد و هەمەدان تا کۆتایی ڕۆژهەلاتی وەك سنووری ژێر دەسەلاتی مەئمون دەستنیشان کرد. دواتر بۆ خەلافەتی قاسمی کوڕی دوای مەئمون بەیعەتی وەرگرت و نازناوی مۆتمنی پێدا. جەزیرە، سنوورەکان و ناوەندی شارەکانی بەو سپارد. عەبدولمەلیك کوڕی سالّح پەروەردە کردنی ئەوی گرتە ئەستۆ. ڕێگە بەمەئمون درا ئەگەر بخوازێت ئەو وەك جێگری خۆی بهێلّێتەوە و ئەگەر نەخوازێت، لایببات.

کاتێك ڕەشید هاوریّ لەگەلّ منالّەکانی، فەقیهەکان، قازییەکان و فەرماندەکان گەیشتە مەککە، نامەی جێگری محەممەد ئەمینی نووسی و گەورەکانی کردە شایەت. هەمووان شایەتییاندا کەئەمین دەبێت بۆ مەئمون ئەمەکدار بێت، پەیمانێکی هاوشێوەی بۆ مەئمون نووسی و هەمووان شایەتییاندا کەمەئمون دەبێت ئەمەکداری ئەمین بێت. ئەم دوونامەی بەدیواری کەعبەوە هەلّواسی و لەناو کەعبە بەیعەتی لەهەمووان بۆ ئەم دووانە وەرگرتەوە. کاتێك ئەو کارەی کرد، خەلّکان گومانیان وابوو بەم کارەی ئاگری لەنێوان ئەمین و مەئمون خۆش کردووە و لەئەنجامەکان ترسان. پێشبینییەکانی ئەوان روویدا.

ڕەشید لەسالّی ١٨٩/ ٧٩٥ زایینی هاوریّ لەگەلّ مەئمون رووی کردە ڕێگەی کرماشان، قازی و شارەزایانی ئایینی کردە شایەت کەسامان، گەنجینەکان، کەرەستەکانی جەنگ و شتەکانی دیکە، تایبەت دەبێت بەمەئمون و دووبارە بەیعەتی بۆ وەرگرتەوە و لەوێوە نامەیەکی ڕەوانەی بەغداد کرد تا جارێکی دیکە بەیعەت بۆ محەممەد ئەمین وەربگرن.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم سالّەدا عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان، لەمەرو بەرەو نەسا کەوتە ریّ تا لەگەلّ باوکی خەسیب بجەنگێت. خوێنی باوکی خەسیبی ڕشت و ژن و کەسەکانی دیل کرد و بەمشێوەیە خوراسان هێور بوویەوە.

لەم سالّەدا خالید کوڕی حارس و بیشر کوڕی موفەزەلّ و باوکی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی محەممەدی فەرازی و عەبدواللە کوڕی سالّح کوڕی عەبدواللە کوڕی

عەباس لەسەلمییە لەمانگی رەبیع الاول/مارس و عەلی کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس لەمانگی ڕەجەب/ ژوئییە، لەتەمەنی شەست و پێنج ساڵی و شەش مانگی (برازای سەفاح و مەنسور)مردن. عومەر کوڕی یونس لەکاتی گەڕانەوە لەحەج بۆ یەمامە و عوباد کوڕی عوباد، فەقیهی بەغداد و شەقران کوڕی عەلی زاهید لەئاندۆلۆس و راشید موالی عیسا کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، هەموویان مردن. راشید لەگەڵ ئیدریس کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن ڕۆشتبوویە مەراکش و دوای مەرگی ئەو باوکی خالید یەزید کوڕی ئەلیسا کاروباری بەربەرەکانی هەڵدەسوڕاند.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و حەوتی کۆچی (٨٠٢ زایینی)

## سەرکوت کردنی بەرمەکییەکان بەدەستی ڕەشید

لەم ساڵەدا ڕەشید بەرمەکییەکانی سەرکوت کرد و جەعفەر کوڕی یەحیای کوشت.

هۆکارەکەی ئەمە بوو: ڕەشید نەیدەتوانی بەرگەی دووری جەعفەر و خوشکەکەی عەباسە کچی مەهدی بگرێت و هەرکات بۆ خواردنەوە دادەنیشت، ئەو دوانەیشی لای خۆی دادەنا. ڕەشید بەجەعفەری وت: عەباسە دەکەمە هاوسەری تۆ تا نەزەری تۆ بۆ ئەو ڕەوا بێت بەو مەرجەی لێی نزیك نەبیتەوە چوونکە بەرگەی دووری ئەو ناگرم. جەعفەر ڕازی بوو و ڕەشید عەباسەی کردە هاوسەری. هەردووك لای ئەو بوون و کاتێك ڕەشید دەڕۆشت، ئەم دووانە کەهێشتا گەنج بوون پێکەوە دەمانەوە و بەمشێوەیە جەعفەر عەباسی لەئامێزی شاوەت گرت و تۆوی کردە ناو منداڵانی ئەو. عەباسە بەکوڕێك بۆ جەعفەر دووگیان بوو. عەباسە لەڕەشید ترسا و منداڵەکەی بەکەنیزەکاندا بۆ مەککە نارد و بۆ بژێوی ژیانی ئەم منداڵە گەوهەر و هەزینەی زۆری بەکەنیزەکاندا.

لەنێوان عەباسە و یەکێك لەکەنیزەکانی ئاژاوە کەوتەوە و ئەم کەنیزە ڕەشیدی لەبوونی ئەو منداڵە ئاگادار کردەوە. ڕەشید لەو ساڵەدا مەبەستی حەجی کردبوو. لێکۆڵینەوەی لەچەند و چۆنی کارەکە کرد و لەبەسەرهاتەکە ئاگادار بوویەوە. جەعفەر هەرکاتێك ڕەشید دەهاتە مەککە بەمەبەستی حەج، ڕەشیدی بۆ سەر سفرەی خۆی بانگێشت دەکرد بەلاّم ئەمجارە ڕەشید بەبانگێشتەکەی ڕازی نەبوو. ئەمە یەکەم هەنگاوی تێکچوونی پەیوەندییەکان بوو.

هەروەها دەڵێن: هۆکاری تێکچوونی پەیوەندی نێوانیان ئەمەیە: ڕەشید، یەحیا کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی بەجەعفەر کوڕی یەحیا کوڕی خالید سپارد. جەعفەر ئەوی لای خۆی دەست بەسەر کرد. شەوێك ئەوی بانگ کرد و لەچەند و چۆنی پرسی. ئەو لەوەلاّمدا وتی: لەکاری من لەخوا بترسە و

خۆت بەدوور بگرە چوونکە لەرۆژی هەستانەوە پێغەمبەر(د.خ) پرسیارت لێدەکات. سوێند بەخوا نەئاژاوەیەکم ناوەتەوە و نە ئاژاوەچیم لەماڵەکەمدا حەشارداوە. جەعفەر بەزەیی پیایدا هاتەوە و وتی: بۆ ناوچەیەکی سەرزەمینی خواوەند دەخوازیت، برۆ. وتی: چۆن برۆم بێ ئەوەی ئەمانم هەبێت و لەگرتنی دووبارە نەترسم؟ جەعفەر کەسی لەگەڵ نارد تا گەیاندییە شوێنی مەبەست.

یەکێك لەسیخوڕەکان فەزڵ کوڕی رەبیع کە لەنزیکەکانی جەعفەر بوو، فەزڵی لەم کارە ئاگادار کردەوە و ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ ڕەشید باس کرد. ڕەشید پێی وت: تۆ چ کارێکت بەم کارانە هەیە؟ ئەو فەرمانەکانی منی جێبەجێ کردووە. ڕەشید جەعفەری بۆ سەر سفرەی خۆی بانگێشت کرد و لەکاتێکدا دەیخوارد، لەگەڵی ئاخاوت تا ئەوەی پرسیاری یەحیای کرد. جەعفەر وتی: هێشتا لەزینداندایە. ڕەشید وتی: سوێند بەگیانی من ڕاست دەکەیت؟ جەعفەر بەزیرەکی تێگەیشت و وتی: سوێند بەگیانی تۆ راست نییە. و لەراستییەکان ئاگاداری کردەوە و زیادی کرد: دڵنیابووم هیچ کارێکی نەشیاوی ئەنجام نەداوە. ڕەشید وتی: کارێکی چاکت کرد، لەمەبەستەکەی دڵم هەنگاوێك زیاتر ڕۆشتیتە پێش. کاتێك جەعفەر ڕۆشت، ڕەشید وتی: خواوەند لەناوم بەرێت ئەگەر لەناوت نەبەم. و بەمشێوەیە پەیوەندی ئەوان ئەنجامێکی لەمشێوەی لێکەوتەوە.

هەروەها دەگێڕنەوە: هۆکاری تێکچوونی پەیوەندی ئەوان ئەمەیە: جەعفەر کۆشکێکی دروست کرد و هەزینەکەیان بەبیست هەزار خەملاند. ڕەشید لەمە ئاگادار بوویەوە و وتی: کاتێك هەزینەی کۆشکەکەی ئەمە بێت، هەزینەی پاداشت و خەرجییەکانی دیکە چەندە. ئەمە لای ڕەشید دژوار بوو.

یەکێکی دیکە لەهۆکارەکانی تێکچوونی پەیوەندی ئەوان ئەمەیە هەرچەند بەهۆکاری سەرەکی نازانن. لەراستیدا سەرەکیترین هۆکارە: لەیەکێك لەسەفەرەکانی حەج یەحیا کوڕی خالیدیان بینیبوو دەستی خستبووە ناو پەردەی کەعبە و دەیوت: خواوەندا! ئەگەر ڕەزامەندی تۆ لەوەدایە نیعمەتەکان لەمن بگریتەوە، ئەو کارە بکە، خواوەندا، ئەگەر ڕەزامەندی تۆ لەوەدایە دارای و ژن و منداڵەکانی من ببەیتەوە بۆ خۆت، ئەو کارە بکە بەڵام تەنیا فەزڵ بۆ من زیندوو

رابگرە. دواتر ڕۆشت و کاتێك گەشتە بەردەم دەرگای مزگەوت، گەڕایەوە و سەر لەنوێ وتەکانی دووبارە کردەوە و ئەمەی وت: خواوەندا! ئەگەر کەسێکی هاوشێوەی من فەزڵ لەکەسانی دیکە جیا دەکاتەوە، دەبێت زۆر پێداگر بێت.

لەم شوێنە لەو بیسترا کەدەیوت: خواوەندا! گوناحەکانم بەرادەیەك فراوان بوون جگە لەتۆ کەس ناتوانێت بیانژمێرێت، خواوەندا! ئەگەر بڕیارت داوە سزای من بدەیت، لەم دنیا سزام بدە تەنانەت ئەگەر ژن و ماڵ و منداڵ و سامانەکەم بگرێتەوە تا ئەو کاتەی ڕەزامەندی تۆی لێدەکەوێتەوە. خواوەندا! سزای من بۆ ئەو دنیا هەڵمەگرە. خواوەند داواکارییەکەی هێنایەدی.

کاتێك لەحەج گەڕانەوە و گەیشتنە ئەنبار، ڕەشید لەعومر، ئۆردووی لێدا و بەرمەکییەکانی سەرکوت کرد.

یەکەم نیشانەی هەژاری و چارەڕەشی ئەوان ئەمە بوو: عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان لەپشت سەری موسا کوڕی یەحیا کوڕی خالید قسەی کرد و بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خوراسان خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان و ڕەشیدی ئاگادار کردەوە کە ئەو نامە بۆ خوراسانییەکان دەنووسێت تا پەیوەستی سوپاکەی ئەو ببن و ئەوان لەفەرمانی سەروەری باوەڕداران دوور دەخاتەوە. ڕەشید بەم تاوانە ئەوی زیندانی کرد و دواتر لەزیندان هێنایەدەر.

یەحیا کوڕی خالید بێ وەرگرتنی مۆڵەت دەڕۆشتە لای ڕەشید. ڕۆژێك ڕۆشتە بارەگای ئەو. جبرائیل کوڕی یەختیشوعی پزیشك لای ئەو دانیشتبوو. سڵاوی کرد و ڕەشید نابەدڵ وەڵامی دایەوە. دواتر ڕەشید ڕوویکردە جبرائیل و وتی: ئایا کەس بێ وەرگرتنی مۆڵەت دێتە ناو ماڵەکەی تۆ؟ وتی: نا. ڕەشید وتی: ئەی بۆ بێ وەرگرتنی مۆڵەت دێنە ناو ماڵەکەی ئێمە؟ یەحیا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەمە یەکەم جار نییە بەمشێوەیە دێمە لای تۆ، سەروەری باوەڕداران خۆی ئەو پێگەی پێبەخشیم تا ئەو جێگەی ئەگەر سەروەری باوەڕداران لەخەویشدا بوایە، من دەهاتمە ژوور. ئەمەم نەدەزانی ئەوەی تا دوێنی سەروەری باوەڕدارانی شادمان دەکرد، ئەمڕۆ چیتر بەڕەوای نازانێت. هەنووکە دەزانم من لەبەر چاوی ئەو لەناو چینی ئەو خەڵکانەدام کەخۆی بەڕەوای دەزانێت. هارون

شەرمەزار بوو، وتی: نەمدەویست بتڕەنجێنم.

کاتێك یەحیا دەڕۆشتە لای ڕەشید، خزمەتکاران بۆ ڕێز گرتن لەو بەپێوە دەوەستان.

ڕەشید بەمەسرور (خزمەتکارە تایبەتەکەی) فەرمانیدا: بەخزمەتکاران بڵێ لەکاتی هاتنی یەحیا هەڵنەستنە سەرپێ. ڕۆژێك یەحیا هات و خزمەتکارێك لەشوێنەکەی نەبزاوت. ڕەنگ بەروخساری یەحیاوە نەما. لەوە بەدوا هەرکات یەحیایان دەدی، پشتیان تێدەکرد.

کاتێك ڕەشید لەحەج گەڕایەوە و لەعومر لەنزیك ئەنبار ئوردووی لێدا، کۆتاییەکانی مانگی موحەرەم/ دێسامبەر بوو. ڕەشید مەسروری خزمەتکاری لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان شەوانە بەدوای جەعفەردا ڕەوانەی کرد. کوڕی بەختیشوعی پزیشك و باوکی زەکاری گۆرانیبێژ لای ئەو بوون. کۆبوونەوەیەکیان ڕێکخستبوو. باوکی زەکار ئەم گۆرانییەی دەخوێند:

فلا تبعد فکل فتی سیأتی علیه الموت یطرق او یغادی

و کل ذخیرة لابد یوما و ان کرمت تصیر الی نفاد

واتاکەی: دوور مەکەوەرەوە چوونکە مەرگ خوازراو یا نەخوازراو یەخەی مرۆڤ دەگرێت، هەر پاشەکەوێت هەرچەند گرانبایی و قورس ڕۆژێك کۆتایی پێدێت.

مەسرور دەڵێت: بەجەعفەرم وت: ئەی باوکی فەزڵ! سوێند بەخوا بۆ کارێك نەهاتووم مەگەر مەرگ کەشەوانە بەرۆکی پێگرتوویت. هەستەو وەڵامی سەروەری باوەڕداران بدەرەوە. جەعفەر کەوتە سەر قاچم و ماچی کرد، داوای لێکردم ڕێگەی بدەم بڕواتە ژوور و وەسیەت نامەکەی بنووسێت. وتم: ڕێگەی ئەو کارەت پێ نادرێت، ئەگەر دەخوازی لێرەدا وەسیەت نامەکەت بنووسە. ئەو وەسیەت نامەکەی نووسی و هەموو کۆیلەکانی ئازاد کرد.

پەیکەکانی ڕەشید بەردەوام دەهاتنە لای من و فەرمانی خێرا کردنیان پێ دەدام. ئەوم بردە لای ڕەشید. ڕەشید لەناو جێگەدا بوو، هاواری کرد سەری بێنە. ڕۆشتمە لای جەعفەر و ئاگادارم کردەوە. وتی: خواوەندا، خواوەندا، ئەم فەرمانەی

نەداوە مەگەر لەکاتی سەرخۆشیدا، لەبەرابەر ئەم فەرمانە تا بەیانی خۆڕاگر بە یا جارێکی دیکە نێوەنجیگەری بکە، گەڕامەوە بەڵکو بتوانم کارێکی بۆ بکەم. بەڵام ڕەشید کاتێك دەنگی پێی منی بیست، هاواری کرد: لێویان خستۆتە سەر لێوی شەرمی دایکت، سەری بێنە. گەڕامەوە و جەعفەرم ئاگادار کردەوە. وتی: دووبارە قسەی لەگەڵ بکە. گەڕامەوە بۆ لای ڕەشید. ئەو بەداردەستەکەی لەسەریدام و وتی: ئەگەر سەری نەهێنیت، کوڕی مەهدی نەبم ئەگەر سەرت لەجەستە جیا نەکەمەوە. مەسرور دەڵێت: گەڕامەوە و جەعفەرم کوشت و سەریم بردە لای ڕەشید. فەرمانیدا منداڵەکان، کەسانی نزیك و هەموو هۆکارەکانی ژیانی یەحیا بگرن. فەزڵ کوڕی یەحیایان شەوانە دەستگیر کرد و لەیەکێك لەکۆشکەکانی ڕەشید زیندانی کرا. یەحیایان لەماڵەکەیدا زیندانی کرد. سامان و کاڵای ئەوانیان گرت و هەمان شەو پەیك بۆ هەموو شارەکان ڕەوانە کرا تا دەست بەسەر سامان و هۆکارەکانی ژیانی بەرمەکییەکان بگرن.

ڕەشید بەرەبەیانی ئەو شەوە پەیکەری بێ گیانی جەعفەری بۆ بەغداد ڕەوانە کرد و فەرمانیدا سەری لەسەر یەکێك لەپردەکان هەڵواسن. جەستەی ئەویان کرد بەدوو کەرت و هەر لەتێکیان لای پردێك هەڵواسی. ڕەشید لە محەممەد کوڕی خالید کوڕی بەرمەك و منداڵەکانی ئەو تۆڵەی نەسەند چوونکە دەیزانی ئەو لەو کارانەی لەناو بنەماڵەکەی ڕوودەدات، بێ ئاگایە. هەروەها دەڵێن: ئەو هەواڵی بەرمەکییەکانی بەڕەشید دەگەیاند. ڕەشید یەحیا و کوڕەکانی فەزڵ، محەممەد و موسای لەزیندانێکی نەزۆر دژوار، زیندانی کرد. لەنێوان ئەوان و خزمەتکارەکانیان جیایی دروست نەکرد و نیازەکانی ئەوانی لەبەختەوەری و چێژ وەرگرتن لەکەنیزەکان دابین کرد.

ئەوان بەشێوەیەکی ئاسوودە ژیانیان بەسەر دەبرد تا ئەوەی ڕەشید عەبدولمەلیك کوڕی ساڵحی دەستگیر کرد و توڕەیی ڕەشید لەو، داوێنی یەحیا و منداڵەکانیشی گرت. چیتر ڕەشید ژیانی لێ تاڵ کردن.

کاتێك جەعفەر کوڕی یەحیا کوژرا، بەباوکیان وت: ڕەشید منداڵەکەتی کوشت. لەوەڵامدا وتی: منداڵەکەی ئەویش بەمشێوەیە دەکوژرێت. پێیان وت: ڕەشید

ماڵەکەتی وێران کرد. لەوەڵامدا وتی: ماڵی ئەویش بەمشێوەیە وێران دەبێت. کاتێك ڕەشید لەمە ئاگادار بوویەوە، وتی: لەوتەکەی ئەو ترسام چوونکە یەحیا هیچ قسەیەك ناهێنێتە سەرزمان مەگەر ئەوەی بێتەدی.

سەلام ئەبرەش دەڵێت: کاتێك گرتنی یەحیا کوڕی خالید ڕۆشتمە لای. پەردەکانی ماڵەکەیان داگرتبوو، کەل و پەلەکانیان کۆکردبوویەوە تا بیبەن بۆ خەلیفە. یەحیا کوڕی خالید وتی: ڕۆژی هەستانەوە بەمشێوەیە. ئەبرەش دەڵێت: ڕەشیدم لەم وتەیە ئاگادار کردەوە. ئەو بیری دەکردەوە و سەیری زەوی دەکرد.

کوژرانی جەعفەر لەشەوی شەممەی سەرەتای سەفەر/ ژانویە روویدا و ساڵەکانی تەمەنی ئەو سی و حەوت بەهار بوو. بۆ ماوەی حەڤدە ساڵ وەك وەزیر خزمەتی کرد.

سەبارەت بەو بەدبەختییە ڕەقاشی یا بەگومانێك باوکی نەواس بەمشێوە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| الان استرحنا و استراحت ركابنا | و امسك من يحدو و من كان يحتدى |
| فقل للمنايا قد ظفرت بجعفر | و لن تظفرى من بعده بمسود |
| و قل للعطايا بعد فضل تعطلى | و قل للرزايا كل يوم تجددى |
| و دونك سيفا برمكيا مهندا | اصيب بسيف هاشمي مهند |

واتاکەی: هەنووکە خۆمان و چوارپێکانمان ئاسوودەین و ئەو کەسەی پێشتر بۆ کاروانییەکان سرودی سارەبان (سارەوان)ی دەخوێند، دەستی ٠ هەڵگرت. بەچوارپێکان بڵێ چیتر لەشەوگەڕی و بڕینی بەردەوامی بیابانەکان ئاسوودەن. بەمەرگ بڵێ بەسەر جەعفەردا زاڵ بوویت و چیتر دوای ئەو بەسەر پیاوێکی وەك ئەودا زاڵ نابیت. بەپاداشەکان بڵێ دوای فەزڵ، چیتر دەرگاکانی خۆتان دابخەن و بەپرسە و ڕەنج بڵێ هەموو ڕۆژێك تازە ببنەوە. لەئێستادا شمشێرێکی بەرمەکی و هندی لەبەرابەر تۆدایە کە بەشمشێرێکی هاشمی و هندی لێوەکەی قەڵشاوە.

یەحیا کوڕی خالید لەکاتی ئەم بەدبەختییەدا وتی: جیهان بەردەوام لەگۆڕاندایە و سامانەکان نەشیاون بۆ مانەوە، پێشینیان نمونەی ئێمەن و ئێمە دەبینە پەندی داهاتووان.

یەحیا لەسەر داواکاریی زیندانییەك بەمشێوەیە زیادی کرد: دەستدرێژی ئەوی گرفتار کرد و پەشمیانی لەگوناح ئەوی رزگار کرد.

جەعفەر کوڕی یەحیا وتی: خەت، نیشانەی فرەزانییە، لەگەڵ ئەوەی ڕەگی فرەزانی بلاّو دەبێتەوە و بەربلاّوییەکان ڕێکدەخرێن.

سومامە وتی: بەجەعفەرم وت: دەربڕین (زمان پاراوی)چییە؟ وتی: ئەوەی وشە، مانای تۆ هەڵبگرێت و سکالاّ لەدەربڕینەکەت نەکرێت، ڕاشکاو بێت و پێویستی بەبیرکردنەوەی زۆر نەبێت.

## گرتنی عەبدولمەلیك کوڕی سالّح

لەم ساڵەدا ڕەشید لەعەبدمەلیك کوڕی سالّح کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس تورە بوو. هۆکارەکەی ئەمەیە: عەبدمەلیك منالێکی بوو بەناوی عەبدولرەحمان نازناوەکەی عەبدمەلیك بەناوی ئەم کوڕەی یانی باوکی عەبدولرەحمان بوو. عەبدولرەحمان لەکەسە دیارەکان بوو. ئەو دەبیری باوکی قومامە لای ڕەشید خراپەی باوکیان هێنایە سەرزمان. بەڕەشیدیان وت ئەو خوازیاری خەلافەتە و چاوی تەماحی تێبڕیوە. ڕەشید ئەوی گرت و لای فەزڵ کوڕی رەبیع زیندانی کرد. رۆژێك لەکاتی تورەیی بانگی کرد و وتی: ئایا ناسپاسی دوای چاکەکاری دەکەیت و خۆت لەو هەموو ڕێز و بەخشینیانە گێژ دەکەیت؟ وەلاّمی دایەوە: ئەی سەروەری باوەڕداران! ئەگەر بەوشێوە بێت، پەشیمانم و هەر سزایەك بۆ من شیاوە، بەلاّم شتی لەو چەشنە لەئارادا نییە مەگەر خراپەکاری ئەو کەسەی رژدی بەمن دەبات. کەسێکی وا هاورێیەتی خۆی و نزیك بوونی تۆی بۆ من لەبیر کردووە. تۆ سەروەری باوەڕداران و جێگری پێغەمبەر(د.خ) لەناو خەڵکاندایت. خەڵکان دەبێت ملکەچی فەرمانی تۆ و چاکەخوازی تۆ بن بەهەمان شێوە کەتۆ دەبێت لەفەرمانڕەوایی دادپەروەری بکەیتە پیشە و لەگوناحی خەڵکان چاوبپۆشیت و بۆ سزادانی کەسەکان پەلە نەکەیت. ڕەشید پێی وت: ئایا بەزمان خۆت لەمن بەکەمتر دەزانیت و لەدڵدا من لەخۆت بەکەمتر دەزانی؟ قومامەی دەبیری تۆ، لەخراپەکاری و خراپەخوازی تۆ دەدوێت. هەنووکە وتەکانی

ئەوببیستە. عەبدمەلیك وتی: شتێکی هێناوەتە سەرزمان کەقسەی دڵی نییە، ئەگەری هەیە لەبەردەم خۆم درۆ نەکات.

قومامە بانگ کرا و ڕەشید پێی وت: بێ هیچ ترسێك، ئەوەی دەیزانی بیهێنە سەرزمان. قومامە وتی: باوەڕی من وایە ئەو مەبەستی خراپەکاری وفریودانی تۆی لەسەر دایە. عەبدمەلیك وتی: ئەو کەسەی لەبەرچاوی خۆم حەیرانم دەکات، چۆن لەپشت سەری خۆم دروم بۆ هەڵنابەستێت؟

ڕەشید وتی: ئەوە عەبدولرەحمانی کوڕی تۆیە و منی لەخراپەخوازی تۆ ئاگادار کردۆتەوە. ئەگەر بڕیارم دەدا کەسانێك بکەمە شایەت، کەسم بەشیاوتر لەم دووانە نەدەبینی. عەبدمەلیك وتی: ئەو یا فەرمانی پێدراوە یا لەدین هەڵگەڕاوەتەوە، ئەگەر فەرمانی پێدراوە، بەخشراوە و ئەگەر هەڵگەڕاوەتەوە، خراپەکار و ناسپاس و خواوەند فەرمانی دوژمنی کردنی ئەوی داوە و بەم فەرموودەیە ئەوی لەخۆی دوور خستۆتەوە: ((هەندێ کات ژن و منالّ دوژمنی ئێوەن، کەواتە خۆیان لێ بەدوور بگرن)) ڕەشید هەستا و وتی: نهێنییەکەی تۆمان بۆ ئاشکرا بوو، بەلاّم پەلە ناکەم تا ئەو کاتەی لەڕەزامەندی خواوەند دڵنیا دەبم و ئەو داوەری نیوان من و تۆ دەبێت. عەبدمەلیك وتی: بەداوەری خواوەند و سەروەری باوەڕداران ڕازیم، هەرچەند دەزانم سەروەری باوەڕداران شەیدایی خۆی پێش ڕەزامەندی خواوەند ناخات. ڕۆژێکی دیکە ڕەشید بانگی کرد و یەکێك لەوتەکانی ئەم هۆنراوە بوو:

اريد حياته و يريد قتلي عذيرك من خليلك من مراد

واتاکەی: من خوازیاری ژیانی ئەوم و ئەو خوازیاری مەرگی من، کێیە بۆ ئەم مەبەستەی هاورێکەت هاوکاریت بکات.

وتی: سوێند بەخوا سەیری لافاوێك دەکەم بەردەوام دەخرۆشێت و هەموو شتێك دادەپۆشێت، گومان دەکەیت ئەو مژدە خراپە دەبینم کەئاگر بڵێسەدار دەکات. ئەی منالەکانی هاشم! کەمێك چاوەڕێ بن، سوێند بەخوا، لەتیشکی فەرمانڕەوایەتی من ڕێگە دژوارەکان بۆ ئێوە ئاسان بووە و ڕەشی و لێڵییەکان ڕووناك بوونەتەوە، جڵەوی کارەکان لەدەستی ئێوەدایە، کەواتە خۆتان بەدوور

بگرن و خۆتان بەدوور بگرن لەپێشهاتێکی خراپ کەکوێرانە دێت و دەست و پێ دەلەرزێنێت.

عەبمەلیك وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەو خوایەی کاروباری ئەم خەڵکەی بەتۆ سپاردووە، بترسە و کەسی ناسپاس مەخەرە شوێنی سپاسگوزار و لەجیاتی پاداش، سزا مەدە. چاکەخوازی خۆم بۆ تۆ لەهێڵەکدا و ملکەچی خۆم رژاندە بەرپێی تۆ. بزماری فەرمانڕەوایەتی تۆم لەکێوی یەلەملەم بەهێزتر کرد و دوژمنەکانی تۆم سەرقاڵ کرد. خواوەندا!، خواوەندا! رێز لەخزمان بگرە و دوای ئەوەی پەیوەستیان بوویت، بەجێیان مەهێڵە، لەگومانی خراپ خۆت بەدوور بگرە چوونکە فەرموودەکانی خواوەند بەئاشکرا سەرکۆنەی دەکات. ئایا ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکات، گۆشتی خۆی لەت لەت دەکات و خوێنەکەی دەخواتەوە؟ سوێند بەخوا رێگە دژوارەکانم بۆ تەخت کردیت و کارە سەرکێشەکانم ڕام و دەستەمۆ کرد. چەندین شەوم بۆ نەهێشتنی ڕەنجی تۆ کردە رۆژ و بۆ پاسەوانی کردن لەفەرمانڕەوایەتی تۆ، خۆم گرفتاری کێشەکان و رووبەرووی تەنگانەکان بوومەوە. هاوشێوەی ئەو کەسەم کەبرای منالەکانی جەعفەر کوڕی کەلاب دەڵێت:

و مقام ضيق فرجته ببيان و لسان و جدل

لو يقوم الفيل او فياله زل عن مثل مقامي و زحل

واتاکەی: چەندە زۆر بوون ئەو جێگە تەنگانەی من بەزمان و وتار فراوانیم پێ بەخشین، ئەو جێگایانەی ئەگەر فیل یا فیلدار لەوێ بێت، دەخلیسکێت و دەکەوێت.

ڕەشید پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر نەمدەویست رێز لەمنالەکانی هاشم بگرم، سەرم لەجەستە جیا دەکردیتەوە. فەرمانیدا زیندانی بکەن.

عەبدوالله کوڕی مالك، فەرماندەی پاسەوانەکانی ڕەشید، ڕۆشتە لای ڕەشید و وتی: سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران: دڵنیان عەبدمەلیك خێرخواز وچاکەخوازی تۆیە، بۆ زیندانیت کرد؟ ڕەشید وتی: هەواڵەکانی ئەو بەمن گەشتووە و بۆتە هۆی ترسی من، دەترسم لەنێوان دوو کوڕەکەم ئەمین و مەئمون دوژمنایەتی دروست بکات، بەڵام ئەگەر بڕوات وایە کەدەبێت ئازادی بکەم، ئازادی

دەکەم. عەبدوالله کوڕی مالك وتی: بەباشی نازانم بەم زووانە رزگاری بکەیت، بەڵام لەزیندان رێزی لێ بگرە. ڕەشید وتی: ئەو کارە دەکەم. فەرمانی بەفەزڵ کوڕی رەبیعدا بڕواتە لای و نیازەکانی دابین بکات. فەزڵ ئەو کارەی کرد.

عەبد مەلیك زیندانی بوو تا ئەو کاتەی ڕەشید مرد. ئەمین ئەوی لەزیندان هێنایەدەر و وەك فەرمانڕەوای شام دەستنیشانی کرد. ئەو لەڕەققە مایەوە و پەیمانی لەگەڵ خواوەند بەست، ئەگەر ئەمین مرد، هیچ کات ملکەچی فەرمانەکانی مەئمون نەبێت بەڵام پێش ئەمین مرد. پێش مەرگ بەئەمینی وتبوو: هەرکات ترسایت، وەرە بۆ لای من، سوێند بەخوا پارێزگاریت لێ دەکەم.

ڕۆژێك ڕەشید بەعەبدمەلیکی وت: تۆ منداڵی سالح نیت. عەبدمەلیك وتی: منداڵی کێم؟ هارون وتی: منداڵی مەروانی جوعدی. عەبدمەلیك وتی: ترسم نییە لەوەی کام یەك لەم دوو جوامێرە، تۆوی خۆی لەناو پزدانی دایکمدا چاندبێت.

ڕۆژێك ڕەشید کەسی بەدوای یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك نارد و پەیامیدا: عەبدمەلیك دەیویست لەبەرابەر من ئاڵای شۆڕش بەرز بکاتەوە و بڕیاریدا بوو بۆ خەلافەت دژایەتی من بکات. لەم بابەتە ئاگادار بوومەوە. هەنووکە تۆ لەزانیارییەکانی خۆت ئاگادارام بکەرەوە چوونکە ئەگەر راستی بڵێیت، پێگەی پێشووت پێ دەبەخشم. یەحیا لەوەڵامدا وتی: سوێند بەخوا بابەتی لەو شێوەم سەبارەت بەعەبدمەلیك نەبیستووە. ئەگەر لەمە ئاگادار دەبووم، پێش تۆ سزام دەگەیاند چوونکە فەرمانڕەوایەتی تۆ فەرمانڕەوایەتی من و پاشایەتی تۆ پاشایەتی منە و چاکە و خراپەکەی منیش دەگرێتەوە. چۆن عەبدمەلیك چاوی تەماح دەبڕێتە خەلافەت و دەستی هاوکاری بۆ من درێژ دەکات؟ ئایا ئەگەر ئەو بێتە سەر کار، خراپتر لەتۆ هەڵس و کەوتم لەگەڵ ناکات؟ سوێندت دەدەم بەخوا ئەم گومانە لەخۆت دوور بکەرەوە. عەبدمەلیك کەسێکی خۆڕاگرە و خۆزگەم دەخواست یەکێك لەبنەماڵەی تۆ بێت. من لەسەر بنەمای وەسف کردنەکانی تۆ فەرمانڕەواییم پێ بەخشی و تۆیش وەسفت کرد چوونکە بینیت کەسێکی باوەڕدار و خۆڕاگرە.

کاتێك نێردراو پەیامەکەی گەیاند، گەڕاندیانەوە و پەیامیان بۆ یەحیا نارد

ئەگەر دژی عەبدمەلیك شایەتی نەدەیت، خوێنی فەزلی کوڕت دەرێژین. یەحیا وتی: تۆ بەسەر ئێمەدا زاڵیت، چیت پێخۆشە ئەنجامی بدە. نێردراو فەزلی بردە لای باوك و ماڵئاوایی لێکرد و لێی پرسی: ئایا لەمن رازیت؟ یەحیا وەڵامی دایەوە: بەڵێ، خوا لێت رازی بێت. ڕەشید بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئەوانی لەیەك جیا کردەوە و کاتێك سەبارەت بەعەبد مەلیك لەو دووانە هیچی نەبیست، دووبار بەدیداری یەك، شادی کردنەوە.

## جەنگ لەگەڵ رۆمییەکان

لەم ساڵەدا قاسم کوڕی ڕەشید لەمانگی شەعبان/ ژوئیە ڕۆشتە ناو سەرزەمینی رۆم. ئەو لەکەنار قوڕە دابەزی و گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە. عەباس کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەسی ڕەوانە کرد. ئەشعەس دەوراندەوری قەلای سینانی گرت بەشێوەیەك خەڵکەکەی بێزار بوون. رۆمییەکان سێسەد و بیست ئەسیری موسوڵمانیان ئازاد کرد بەو مەرجەی قاسم چاوی تەماح لەسەرزەمینەکەیان هەڵگرێت. قاسم رازی بوو و بەئاشتی لەیەك جیابوونەوە.

عەلی کوڕی عیسا لەم هێرش کردنە بۆ سەر رۆم مرد. فەرمانڕەوای رۆم لەم کاتەدا ژنێك بوو بەناوی رەینی. رۆمییەکان ئەم ژنەیان لەسەر تەخت هەڵگرت و نەقفوریان لەجێگەی ئەو دانا. رۆمییەکان گومانیان دەکرد نەقفور لەپشتی جوفەنە کوڕی غەسانە. رەینی پێنج مانگ دوای ئەوەی لەسەرکار لابرا، مرد.

کاتێك رۆمییەکان لەپاشایەتی نەقفور دڵنیا بوون، خۆی نامەیەکی بۆ ڕەشید نووسی بەم ناوەرۆکە: لەنەقفور پاشای رۆمییەکان بۆ ڕەشید پاشای عەرەبەکان:

دوای سڵاو بۆ یەزدان، ئەو شاژنەی پێش من بوو، تۆی بەقەڵا و خۆی بەسەرباز (یاری شەترەنج) هەژمار دەکرد. دەبوا چەندین بەرابەری ئەو سامانەی بۆ تۆی دەنارد، بۆت بناردایە بەلام ئەو ناتەوانە و ژن و ژنانیش نەزانن، ئێستا کەنامەکەی من دەخوێنیتەوە، دەبێت هەموو ئەو سامانەی بەدەستت گەشتووە، بگەڕێنیتەوە و بەهای گیانی خۆتی بزانیت و گەرنە بەزۆر ئەو کارە دەکەم و ئەگەر رازی نەبیت، شمشێر لەنێوان ئێمە داوەری دەکات.

ڕەشید کاتێك نامەکەی خوێندەوە، خوێنی کوڵ هات بەشێوەیەك کەس نەیدەتوانی سەیری ناوچاوی بکات، هەمووان بێدەنگ بوون مەگەر ئەو کاتەی خۆی قسەی دەکرد. کەسانی دەوروبەری بڵاوەیان لێکرد. ڕەشید داوای مەرەکەبی کرد و لەپشتی ئەو نامەیە نووسی: بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان، لەهارون سەروەری باوەڕداران بۆ نەقفور سەگی ڕۆمییەکان، ئەی دایك کافر! نامەکەتم بینی، وەڵامەکەی دەبێت بیبینیت نەك بیبیستیت. والسلام.

هارون هەمان ڕۆژ ڕێگەی ڕۆمی گرتەبەر و دەستی بەسەر هێرەقلەدا گرت و تالانییەکانی کۆکردەوە و سوتاندی و وێرانی کرد. نەقفور داوای لێکرد لەبەرابەر باجێکی دیاریکراوی ساڵانە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ واژۆ بکات. ڕەشید بەداواکەی ڕازی بوو.

کاتێك ڕەشید لەجەنگ گەڕایەوە وگەیشتە ڕەققە، نەقفور پەیمانەکەی شکاند. لەم کاتەدا هەوا سارد بوو. نەقفور لەگەڕانەوەی ڕەشید ئاسوودە بوو. کاتێك هەواڵی پەیمان شکێنی نەقفور گەیشت، کەس بوێری ئاگادار کردنەوەی ڕەشیدی نەبوو چوونکە دەترسان لەوەی ناچار بن لەم هەوا ساردەدا سەر لەنوێ ڕێگەی ڕۆم بگرنەبەر. هەمووان بەباشیان زانی چارەی ئەم کارە بەیەکێك لەسوپاییە شاعیرەکانی ڕەشید بەناوی باوکی محەممەد عەبدوالله کوڕی یوسف و بەگومانێك حەجاج کوڕی یوسفی تیمی بسپێرن. ئەو چەندین دێری هۆنییەوە وەك:

نقض الذی اعطیته نقفوز فعلیه دائرة البوار تدور

ابشر امیر المومنین فانه فتح اتاك به الاله کبیر

فتح یزید علی الفتوح یؤمنا بالنصر فیه لواؤك المنصور

واتاکەی: نەقفور پەیمانی ئاشتییەکەی شکاند، ریسوایی و پەستی بەسەر ئەودا زاڵ دەبێت. ئەی سەروەری باوەڕداران مژدەت لێ بێت کەخواوەندی گەورە ڕێگە چارەیەك دەخاتە بەردەمی تۆ، ڕێگە چارەیەکی گەورەتر لەوەی بووتە، ئاڵای سەرکەوتنی تۆ لەپێش ئێمەوە بەسەرکەتوویی دەڕواتە پێش.

ڕەشید کاتێك ئەم هۆنراوەی بیست، پرسی: ئایا نەقفور ئەم کارەی کردووە؟ زانی ئەمە ڕێگە چارەی وەزیرەکانی بووە. بەمشێوە ئەو لەدژوارترین ساتەکان

مەبەستی هێرش کردنە سەر ڕۆمی کرد و گەیشتە سەرزەمینی ئەوان و تا ئەو کاتەی دڵی ئاسوودە بوو، مایەوە و ئەوەی دەیخواست، بەدەستی هێنا.

دەڵێن: پەیمان شکاندنی نەقفور و ئەم هۆنراوەیە بووە هۆی ئەوەی ڕەشید رووبکاتە ڕێگەی ڕۆم و دەست بەسەر هێرەقلەدا بگرێت. بەخواستی خوا لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٠/٨٠٥ زایینی باسی دەکەین.

## چۆنیەتی کوژرانی ئیبراهیم کوڕی عوسمان کوڕی نەهیک

لەم ساڵەدا، ڕەشید ئیبراهیم کوڕی عوسمان کوڕی نەهیکی کوشت. هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بوو کەعوسمان، بەردەوام بیری جەعفەر کوڕی یەحیا و بەرمەکییەکانی دەکردەوە و فرمێسکی بۆ ئەوان دەباراند تا ئەوەی دەستبەرداری گریان بوو و داوای تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئەوانی کرد. ئەو هەرکات لەگەڵ کەنیزەکانی خۆی دەیخواردەوە، شمشێری هەڵدەگرت و دەیوت: هاوار لەمن، جەعفەری من، گەورەی من، سوێند بەخوا ماڵی بکوژەکەت وێران دەکەم و تۆڵەت دەستێنم.

کاتێك لەدووبارە کردنەوەی بەردەوام بوو، کوڕەکەی و کۆیلەکەی ڕەشیدیان ئاگادار کردەوە. ڕەشید ئەوی بانگ کرد، خواردنەوەی پێدا و ئەوسا وتی: من لەکوشتنی یەحیا کوڕی جەعفەر پەشیمانم، خۆزگە فەرمانڕەواییم لەدەست دەدا بەڵام ئەوم نەدەکوشت، چاوەکانی من لەو کاتەوەی ئەو کوژراوە، خەوی خۆشیان نەبینیوە.

ئیبراهیم کاتێك ئەم وتانەی بیست، فرمێسك لەچاویدا کۆبوویەوە و وتی: خوا لەباوکی فەزڵ خۆشبێت! سەروەرم، سوێند بەخوا کوشتنی ئەو نابەجێ و کارێکی کوێرانە بوو، چیتر لەجیهان ناتوانیت کەسی وەك ئەو ببینیت.

ڕەشید وتی: نفرینی یەزدان لەتۆ بێت، هەستە ئەی زادەی ژنی ناپاك! ئیبراهیم هەستا لەکاتێکدا نەیدەزانی چۆن هەنگاو هەڵبگرێت. چەند شەو دوای ئەم ڕووداوە، کوڕەکەی ڕۆشتە سەرسەری و بەشمشێر سەری بڕی.

چۆنیەتی گرتنی تەتیلە لەلایەن فەڕەنگییەکان

لەم ساڵەدا فەڕەنگییەکانی شاری تەتیلە گەمارۆی ئاندۆلۆسیاندا. هۆکارەکەی ئەوە بوو حەکەم فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس فەرماندارێکی گەورە لەسوپاکەی خۆی بەناوی عەمروس کوڕی یوسفی بۆ پاراستنی سنوورەکانی ئاندۆلۆس دیاریکرد و ئەو کوڕەکەی کردە فەرمانڕەوای تەتیلە. بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار لەترسی حەکەم لەئاندۆلۆس ڕایان کرد چوونکە نافەرمانی ئەویان کردبوو. ئەوان پەیوەستی ناباوەڕان بوون و بەمشێوەیە هێزیان زیادی کرد و ژمارەیەکی زۆر پەیوەستیان بوون. دواتر ڕوویان کردە تەتیلە و گەمارۆیان خستەسەر و موسوڵمانانیان دەرپەڕاند. یوسف کوڕی عەمروسی فەرمانداریان گرت و لەسەخرەی قەیس زیندانییان کرد.

عەمروس کوڕی یوسف لەساراگوزا جێگیر بوو تا ئەو شارە لەهێرشی ناباوەڕان بپارێزێت. ئەو سوپایەکی کۆکردەوە و کوڕە مامەکەی وەك فەرماندە دیاریکرد. ئەو ڕووبەڕووی ناباوەڕان بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و بڵاوەی بەسوپاکەیان کرد و تامی تاڵی شکستی پێ چێشتن. زۆرینەی ئەوان کوژران و دەستەیەکیان تێکشکاو و هیلاك، گیانیان دەرباز کرد. سوپا بەرەو سەخرەی قەیس بەڕێکەوت و گەمارۆی خستەسەر. ناباوەڕان نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن چوونکە ئەو شکستە هێزی لێ بڕیبوون. کاتێك موسوڵمانان دەستیان بەسەر ئەو ناوچەدا گرت، یوسف کوڕی هەمروسیان ڕزگار و بۆ لای باوکی ڕەوانەیان کرد. پێگەی عەمروس لەناو ناباوەڕان بەرز بوویەوە و ناووناوبانگی کەوتە سەر زاران. ئەو فەرماندەی سنوورەکان بوو.

## سەرکوتی خەڵکانی کوردوبا لەسەر دەستی حەکەم

حەکەم لەسەرەتای فەرمانڕەوایی خۆی بەئاشکرا دەیخواردەوە و خۆشی لەژیان دەبرد. لەو ڕۆژانەدا کوردوبا شارێکی زانست خواز و چەندین فرەزانی داوێن پاکی تیا دەبینرا وەك یەحیا لەیسی (ڕاوی ) کتێبی (موطا) و مالك و کەسانی دیکە.

دانیشتووانی کوردوبا دژی ئەو راپەڕین و کردەوەکانیان بەناپەسەند هەژمار کرد و بەردبارانیان کرد. بڕیاریاندا خوێنی بڕێژن. دەستەیەك لەسوپاییەکان ڕێگریان لەکوشتنی ئەو کرد و دووبارە ئارامی باڵی بەسەر شارەکەدا کێشا.

چەند رۆژ دواتر سەرکردەکان و فەقیهەکانی کوردوبا لای محەممەد کوڕی قاسمی قورەشی مەروانی، مامی هاشم کوڕی حەمزە کۆبوونەوە و هاوشێوەی فەرمانداری کوردوبا بەیعەتیان لەگەڵ بەست و پێیان وت دانیشتووانی ئەم شارە بەگشتی بەم کارە رازین. ئەو شەوێك مۆڵەتی ویست تا ئەندێشە لەم کارە بکات و لەخوا بپارێتەوە. ئەوان ڕۆشتن. محەممەد ڕۆشتە لای حەکەم و ئاگاداری کردەوە و لەبەیعەتی خۆی دڵنیایی کردەوە. حەکەم داوای لێکرد بەپێشنیاری خەڵکان رازی بێت. ئەو چەند لەکەسانی نزیکی خۆی لەگەڵدا نارد تا دوور لەچاوی خەڵکان لەوێ ئامادە بن. خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە و پرسیاریان لێکرد ئایا بەرێبەرایەتی رازی دەبیت یا نە؟ ئەو لەترسا هەموو شتێکی باس کرد و ئەوانی لەئەنجامی کارەکەیان ترساند. محەممەد کوڕی قاسم پرسیاری ناو و هاورێکانی ئەوانی کرد و ئەوان هەموو کەسە دیارەکانی شاریان ناو برد کەهاوکاری ئەو کارە بوون. نێردراوی حەکەم ناوی هەموویانی نووسی. محەممەد کوڕی قاسم پێی وتن: ئەم کارە بەخواستی خوا، رۆژی هەینی و لەمزگەوتی هەینی روودەدا.

ئەو لەگەڵ نێردراوەکەی حەکەم بەرێکەوت و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە. پێنج شەممە بوو. هەمان شەو حەکەم هەموو کەسە ناوبراوەکانی دەستگیر کرد و دوای چەند رۆژ فەرمانیدا لەدەوری کۆشکەکەی هەڵیانواسن. ژمارەی ئەم کەسانە حەفتا و دوو کەس بوو. برای یەحیا کوڕی یەحیا و کوڕی باوکی کەعب لەناویاندا دەبینران. ئەم رۆژە، رۆژێکی نەنگین و دوژمنایەتی خەڵکان لەگەڵ حەکەم زیادی کرد.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا دەمارگیری موزێرییەکان و یەمانییەکان بەرز بوویەوە. ڕەشید محەممەد کوڕی مەنسور کوڕی زیادی نارد و ئاشتی لەنێواندا سەقامگیر کردن.

لەم ساڵەدا زەمینی مەسیسە لەرییەوە و دیوارەکەی دارما. لەیەکەم کاژێرەکانی ئەم ئەرد هەژێنە، ئاوی شار بەقولایی زەویدا ڕۆشتەخوار.

لەم ساڵەدا عەبدسەلام لەئامێد ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و فەرمانڕەوایی گرتەدەست. بەلام یەحیا کوڕی سەعدی عوقەیلی خوێنی ڕشت.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید قاسمی کوڕی بۆ جەنگی هاوینە ڕەوانە کرد. ڕەشید مناڵەکەی خۆی بەخوا بەخشی و ئەوی کردە هۆکاری نزیك بوونەوەی خۆی لەخواوەند و فەرمانڕەوایی ناوەندەکانی بەو سپارد.

عەبدوالله کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا فوزەیل کوڕی عەیازی خواپەرست کۆچی دوایی کرد. زادگای ئەو سەرمەقەند و دواتر رووی کردە مەککە و لەهەمان شار، مرد.

لەم ساڵەدا مەعمەر کوڕی سلێمان کوڕی تەرخانی تیمی باوکی محەممەدی بەسری مرد. ئەو لەساڵی ٧٢٤/١٠٦ زایینی یا ١٠٧/ ٧٢٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. عومەر کوڕی عوبەیدی تەنافسی کوفی لەم ساڵەدا مرد.

لەم ساڵەدا باوکی سەلەم مەعزی هەڕائی نەحوی کۆچی دوایی کرد. دەڵێن نازناوەکەی باوکی عەلییە. کەسائی زانستی نەحو لەو فێر بوو. ئەو لەرۆژگاری یەزید کوڕی عەبدولمەلیك چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و هەشتی کۆچی ( ٨٠٣ زایینی )

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی جبرائیل فەرماندەی جەنگی هاوینە بوو و لەرێگەی سەفسافەوە ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ڕۆم. نەقفور پاشای ڕۆم ڕووبەڕووی بوویەوە بەڵام کارێکی بۆ هاتە پێش کەرێگەی ڕووبەڕوو بوونەوی ئیبراهیمی لێگرت. ئەو لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانان ڕووبەڕوو بوویەوە و لەسێ جێگەوە بریندار بوو. وەك دەڵێن چل هەزار و حەوتسەد ڕۆمی لەم جەنگەدا کوژران.

لەم ساڵەدا قاسم کوڕی ڕەشید لەدابق فەرمانڕەوایەتی کرد و ڕەشید ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. سامانێکی زۆری لەناو خەڵکان دابەش کرد و بەوتەیەك ئەمە دوواپین حەجی ئەو بوو.

لەم ساڵەدا جەریر کوڕی عەبدولحەمیدی زەبتی ڕازی لەتەمەنی حەفتا و هەشت ساڵی مرد. عەباس کوڕی ئەحنەفی شاعیر لەم ساڵە یا بەوتەیەك لەساڵی ١٩٣/ ٨٠٨ زایینی مرد. باوکی ئەو ئەحنەف لەساڵی ١٥٠/٧٦٧ زایینی مرد.

لەم ساڵەدا شوهەید کوڕی عیسا لەئاندۆلۆس لەتەمەنی نەوەد و سێ ساڵی مرد. ئەو لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی معاویە هاتبوویە ئاندۆلۆس.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و هەشتا و نۆی کۆچی ( ٨٠٤ زایینی )

### ڕۆشتنی ڕەشید بۆ ڕەی

لەم ساڵەدا ڕەشید ڕووی کردە ڕەی. هۆکاری ئەم سەفەرە ئەوە بوو کاتێك ڕەشید، عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهانی وەك فەرمانداری خوراسان دیاری کرد، عەلی ستەمکاری کردە پیشە و هەڵس و کەوتی خراپی لەگەڵ خەڵکانی خوراسان گرتەبەر. گەورەکان و کەسە دیارەکانی ئەو شارە نامەیەکیان بۆ ڕەشید نووسی و لەخراپەکاری و ستەمکاری عەلی کوڕی عیسا سکاڵایان بەرز کردەوە و نووسیان: خەڵکانی خوراسان بەسوك دەزانێت وبەزۆر دەست بەسەر سامانیاندا دەگرێت. بەڕەشید وترا: عەلی کوڕی عیسا مەبەستی ناسازگاری هەیە. ڕەشید لەجومادی الاول/ئاوریل هاوریێ لەگەڵ دوو کوڕەکەی مەئمون و قاسم کەدوای مەئمون بەیعەتی بۆ وەرگرتبوو، ڕێگەی ڕەی گرتەبەر. ڕەشید کاری خەلافەتی قاسمی بەمەئمون سپاردبوو ئەگەر بخوازێت دەتوانێت لەسەر کار لاییبات و ئەگەر نەخوازێت دەتوانێت وەك جێگری خەلیفە بیهێڵێتەوە. ئەو فەقیە و قازی و زاناکانی کردە شایەت کەگەنجینەکان و کەرەستەکانی جەنگ و چوارپێکان و هەموو سامانی سوپا تایبەتە بەمەئمون و ڕەشید هیچ پشکێکی لەوانەدا نییە.

ڕەشید بۆ ماوەی چوار مانگ لەڕەی مایەوە تا عەلی کوڕی عیسا لەخوراسانەوە هات. دیاری و پێشکەشی و سامانی فراوانی لەزێر و گەوهەر بەسەر دەبیر و منداڵ و هاورێیان و فەرماندەکانی ڕەشید دابەش کرد. ڕەشید گومانی کرد بوختانیان بۆ هەڵبەستووە و دووبارە فەرمانڕەوایەتی خوراسانی پێبەخشییەوە.

کاتێك ڕەشید لەڕەی مایەوە، حسەینی خزمەتکاری بەئەمان نامەیەك بۆ لای شەروین کوڕی قارن و ئەمان نامەیەك بۆ وەندا هورموز باوەگەورێی مازیار و ئەمان نامەیەك بۆ مەرزبان کوڕی جوستان، فەرمانڕەوای دەیلەم، ڕەوانەی تەبەرستان کرد. جوستان و وەندا و هورموز هاتنە بارەگای ڕەشید. ڕەشید ڕێزی لێگرتن. وەندا ملکەچی فەرمانەکانی ڕەشید بوو و دانی باج لەلایەن شەروینی گرتە ئەستۆ.

ڕەشید بۆ عێراق گەڕایەوە و لەکۆتایی زیحەججە/ئۆکتۆبەر ڕۆشتە ناو بەغداد و کاتێك لەپردی بەغداد گوزەری کرد، فەرمانیدا جەنازەی جەعفەر کوڕی یەحیا بسوتێنن. ئەو لەبەغداد نەمایەوە و هەمان سات ڕێگەی ڕەققەی گرتەبەر. کاتێك لەبەغداد تێپەڕی، وتی: سوێند بەخوا شارێك بەجێ دێڵم نە لەڕۆژهەڵات و نە لەڕۆژئاوا ئاسوودەتر و پارێزراوتر هیچ شوێنێکی دیکە بوونی نییە. ئەم شارە دەبێتە پێگەی فەرمانڕەوای عەباسییەکان تا کۆتایی. ئەوانیش ئەم شارەیان پاراستووە و دەیپارێزن. هیچ یەك لەپێشینیانی من خراپەیان لەم شارە نەبینیوە و نایبینن. شوێنێکە زۆر گونجاوە بەڵام بڕیارمداوە لەشوێنێك بژیم کە ناسازگاران و نەیاران و دووڕووەکان و ئاژاوەچییەکان و دوژمنانی پێشەواکان ورێنشیاندەرانی دین لەوێ دەژین (شام) ئەو کەسانەی بنەماڵەی نفرین کراوی ئومەییەیان خۆش دەوێت و هەموو ناباوەڕان و دز و چەتەکان لەوێن. ئەگەر لەبەر ئەمە نەدەبوو بەغدادم بەجێنەدەهێشت (ماڵئاواییم لێ نەدەکرد. عەباس کوڕی ئەحنەف لەبەر ڕۆشتنی ڕەشید لەبەغداد وتی:

| | |
|---|---|
| ما انحنا حتى ارتحلنا فمانفد | رق بين المناح والارتحال |
| سألونا عن حالنا اژ قدمنا | فقرنا و داعهم بالسوال |

واتاکەی: هێشتا نیشتەجێ نەببووین، بارمان بەست کەواتە چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان نیشتەجێ بوون و بار بەستن. کاتێك ڕۆشتینە ئەوێ، لەحاڵیان پرسین، وەڵامی ئەوان ماڵئاوایی ئێمە بوو.

## شۆڕشی تەرابلوسی ڕۆژهەلات

لەم ساڵەدا شۆڕشی خەڵکانی تەرابلوسی ڕۆژهەڵات لەسەر فەرمانڕەواکانیان گەشتە ترۆپك. لەم کاتەدا ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب فەرمانداری ئەفریقییە بوو. ئەو چەندین کارگوزاری بۆ ناوچەکانی ئەفریقییە دیاری کردبوو کەخەڵکان لێیان نارازی بوون. ئەو بەردەوام کارگوزارێکی لادەبرد و کەسێکی دیکەی لەجێگەی ئەو دادەنا. ئیبراهیم لەم ساڵەدا سوفیان کوڕی مەزائی بۆ چوارەمین جار وەك فەرمانداری ئەو دیارە ڕەوانە کرد. خەڵك بڕیاریاندا دەریپەڕێنن و بۆ قەیرەوانی

بگەڕێننەوە. بەمشێوەیە دژی ئەو ڕاپەڕین. ئەو کەرەستەی جەنگی هەڵگرت و لەگەڵ دەستەکەی خۆی دژی ئەوان جەنگی. ئەویان لەماڵەکەی دەرکرد و پەنای بۆ مزگەوتی هەینی برد و لەوێ ئاگری شەڕی خۆش کرد. خەڵك هاوڕێکانیان کوشت بەلام ئەمانیان بەخۆیدا. ئەو لەشەعبان/ ژوئیەی ئەم ساڵە ناوچەکەیانی بەجێهێشت. فەرمانڕەوایەتی ئەو بیست و حەوت ڕۆژ زیاتری نەخایاند.

سوپای نیشتەجێی تەرابلوس ئیبراهیم کوڕی سوفیانی تەمیمییان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد.

ماوەیەك دواتر لەنێوان خەڵکانی تەرابلوس و دەستەیەکی ناسراو بەمناڵەکانی باوکی کینانە و مناڵەکانی یوسف چەندین جەنگ ڕوویدا تا ئەوەی تەرابلوس وێران و ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب لەم پێشهاتانە ئاگادار بوویەوە. ئەو سوپایەکی بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان هاوولاتیان و مناڵەکانی باوکی کینانە و مناڵەکانی یوسف بێنن. لەزیحەججە/ئۆکتۆبەر ئەوانیان بردە بەردەم بارەگای ئیبراهیم. کاتێك ئیبراهیمیان بینی، داوای بەخشینیان لێکرد. ئیبراهیم چاوپۆشی لەکار و کردەوەکانی ئەوان کرد و هەموویان بۆ شارەکانی خۆیان گەڕانەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا گۆڕینەوەی ئەسیرەکان لەنێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان ئەنجامدرا. هیچ موسوڵمانێك لەسەرزەمینی ڕۆم نەمایەوە بەهای ئازادییەکەی نەدرێت. عەباس کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید کاتێك بۆ ڕەی دەڕۆشت، عەبدوللە کوڕی مالکی وەك فەرمانڕەوایی تەبەرستان، ڕەی، دەماوەند، گومش و هەمەدان دیاری کرد..

باوکی عەتاهییە لەڕێگەی ئەو بۆ ڕەی کەزادگای ڕەشید بوو، ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| ان امین الله فی خلقه | حن به البر الی مولده |
| لیصلح الری و اقطارها | و یمطر الخیر بها من یده |

واتاکەی: بڕواپێکراوی خواوەند لەنێوان ئافرێنراوەکانی ئارەزوومەندی گەیشتن بەزادگاکەیەتی تا ڕەی ناوچەکانی دەوروبەری سامان بدات و بارانی چاکە لەوێ لەدەستی ببارێنێت.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی حەسەنی شەیبانی فەقیە، قوتابی باوکی حەنیفە و حەمەید کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حومەیدی رواسی و باوکی عەوف و سابق کوڕی عەبدوڵڵەی موسڵی کەبەردەوام لەترسی خواوەند دەگریا، کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەدی کۆچی ( ٨٠٥ زایینی )

## لابردنی رافیع کوڕی لەیس کوڕی نەسر کوڕی سەیار

لەم ساڵەدا رافیع کوڕی لەیس کوڕی نەسر لەماوەرائەلنەهری سەمەرقەند ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ڕەشید گرتەبەر.

هۆکارەکەی ئەمە بوو: یەحیا کوڕی ئەشعەس کوڕی یەحیای تائی بوو بەهاوسەری کچە مامی خۆی باوکی نەعمان. ئەو ژنێکی بەتوانا و زمان پاراو بوو. دواتر یەحیا ئەوی بەجێهێشت و لەبەغداد مایەوە و دەستی بەرابواردن لەگەڵ کەنیزەکان کرد. کاتێك بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو، هاوسەرەکەی مەبەستی جیابوونەوەی کرد و رافیعی ئاگادار کردەوە. رافیع چاوی تەماحی بڕییە خۆی و سامانەکەی و بەشێوەیەکی نهێنی پەیکی بۆ لای ڕەوانە کرد. پەیامیدا: تەنیا ڕێگەی جیابوونەوە لەیەحیا ئەوەیە دەستەیەك شایەتی بدەن ئەو شەریکی بۆ خواوەند داناوە و دواتر پەشیمان بۆتەوە و بەمشێوەیە پەیوەندی هاوسەرگیری نێوان ئەوان دەپچڕێت و ڕێگە بۆ هاوسەرەکانی دیکە دەکرێتەوە. ئەو ژنە ئەم کارەی کرد و رافیع ئەوی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. یەحیا کوڕی ئەشعەس لەم کارە ئاگادار بوویەوە و لای ڕەشید سکاڵای کرد. ڕەشید فەرمانێکی بۆ عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان نووسی تا ئەو دووانە لەیەك جیا بکاتەوە و سزای رافیع بدات و قامچی بارانی بکات و سوار لەسەر کەرێك بەناو سەمەرقەندا بیگێڕێت تا ببێتە وانەیەك بۆ کەسانی دیکە. عەلی عیسا فەرمانەکەی جێبەجێ کرد بەڵام قامچی لێنەدا. رافیع لەژنەکە جیابووەوە و لەسەمەرقەند زیندانی کرا بەڵام لەزیندان هەڵات و پەنای بۆ عەلی کوڕی عیسا لەبەلخ برد. عەلی کوڕی عیسا مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام عیسا کوڕی عەلی کوڕی عیسا نێوەنجیگەری کرد و نەیهێشت بیکوژێت. پێشنیاری کرد ڕەوانەی سەمەرقەندی بکات. عەلی کوڕی عیسا ئەوی ڕەوانەی سەمەرقەند کرد. رافیع هێرشی کردە سەرکارگوزارەکەی عەلی کوڕی عیسا لەسەمەرقەند و خوێنی ڕشت و دەستی

بەسەر سەمەرقەندا گرت. عەلی کوڕی عیسا کوڕەکەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد بەڵام رافیع شکستی پێ هێنا. عەلی کوڕی عیسا هێزی کۆکردەوە و خۆی بۆ شەڕ لەگەڵ رافیع ئامادە کرد. بەمشێوەیە ئەو ساڵە کۆتایی پێهات.

## گرتنی هێرەقلە

لەم ساڵەدا ڕەشید دەستی بەسەر هێرەقلەدا گرت. هۆکارەکەی ئەوە بوو لەساڵی ٨٠٢/١٨٧ زایینی سەبارەت بەفرت و فێڵی نەقفور ئاماژەی پێدرا. گرتنی ئەم شارە لەشەوال/ئوتی ئەم ساڵە ڕوویدا. بۆ ماوەی سی ڕۆژ گەمارۆی خرایەسەر و خەڵکەکەی زیندانی کران. ڕەشید لەگەڵ سەد و سی و پێنج هەزار مووچەخۆر رووی کردە ئەم شارە جگە لەخۆبەخش و پێشەنگەکان و ئەو کەسانەی ناویان لەناو پێرستی مووچەوەرگرەکان نەدەبینرا. عەبدوالله کوڕی مالك لەزی ئەلکەلاع ئوردووی لێدا. ئەو داود کوڕی عیسا کوڕی موسای لەگەڵ حەفتا هەزار شەڕکەر بۆ سەرزەمینی ڕۆم ڕەوانە کرد تا وێرانی بکات و تالآنییەکان کۆبکاتەوە. خواوەند کار ئاسانی بۆ کرد. سەراحیل کوڕی مەعن کوڕی زائیدە دەستی بەسەر قەڵای سەقلەبییەکان و دەلسەدا گرت، یەزید کوڕی مەخلەد، سەفساف و مەلقونییەی گرت، حومەید کوڕی مەعیوب بۆ هێرش کردنە سەر کەنارەکانی دەریای شام و میسر (مەدیتەرانە) راسپێردرا و تا قوبرس پێشڕەوی کرد. ئەو، ئەوەی لەسەر رێگە رووبەرووی بوویەوە، وێرانی کرد و کردییە خۆراکی ئاگر و حەڤدە هەزار کەس لەدانیشتووانەکەی دیل کرد و لەگەڵ خۆی بۆ رافیقەی برد و فرۆشتی. تەنیا بەهای ئازادی قوبروس دوو هەزار دینار بوو.

ڕەشید رووی کردە رێگەی تەوانە و دەستی بەسەردا گرت. لەوێ گوزەری کرد و عوقەبە کوڕی جەعفەری وەك جێگری خۆی دانا.

نەقفور باج و سەرانەی نارد. بۆ سەری خۆی چوار دینار وبۆ سەری مناڵەکان و گەورەکان و دەربارییەکان دوو دینار، بۆ بەتریرك دوو دینا. نەقفور نامەیەکی بۆ ڕەشید نووسی و داوای ئازادی کچێکی ئەسیری کرد کەدەزگیرانی کوڕەکەی بوو. ڕەشید کچەکەی ئازاد کرد.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا یاخی پیشەیەك بەناوی سەیف کوڕی بوکەیر لەکەنارەکانی عەبد قەیس ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە. ڕەشید، محەممەد کوڕی یەزید کوڕی مەزیدی بۆ جەنگی ئەو نارد و توانی لەعەین نورە خوێنی سەیف برێژێت.

لەم ساڵەدا خەڵکانی قوبروس پەیمانیان شکاند. مەعیوب کوڕی یەحیا ڕووبەڕوویان بوویەوە و گرفتاری کردن.

عیسا کوڕی موسای هادی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی سەهل (شوێنکەوتەی ئایینی زەردەشتی) لەسەر دەستی مەئمون باوەڕی بەئیسلام هێنا. دەستەیەك گومان دەکەن باوکی فەزڵ لەزینداندا لەسەر دەستی مەهدی باوەڕی بەئایینی ئیسلام هێنا. دەستەیەك دەڵێن فەزڵ و حەسەنی برای لەسەر دەستی یەحیا کوڕی خالید باوەڕیان هێنا و یەحیا ئەوی بۆ کار کردن لەدەرگای مەئمون هەڵبژارد. لەبەر ئەمە فەزڵ ڕێزدارانە سەیری بەرمەکییەکانی دەکرد و پێگەی ئەوانی بەرز کردەوە. نازناوی ئەو زوریاستینە چوونکە هەم وەزیر بوو هەم سەرکردەی سوپا. ئەو بەشیعی لەقەڵەم دەدرا. ئەو کەسە بوو پێشنیاری بەمەئمون کرد عەلی کوڕی موسای ڕەزا وەك جێگری خۆی دەستنیشان بکات.

لەم ساڵەدا خالید کوڕی یەزید کوڕی حاتەم کوڕی قەبیسە کوڕی موهەلیب فەرمانداری موسڵ بوو. کاتی ڕۆشتنی ڕەشید بۆ موسڵ ئالاکەی لەکەنار شار بوو بەدوو لەت و ئەم ڕووداوە بەشوم لەقەڵەم درا. باوکی شەیسی وتاردەر کەهاوڕێیەتی ئەوی دەکرد، وتی:

ماکان منکسر اللوأ لطیرة تخشی و لا امر یکون مؤیلا

لکن هذا الرمح اضعف رکنه صغر الولایة فاستقل الموصلا

واتاکەی: شکانی ئالاکە شیاو نییە بەشومی بزانین و ترسێنەر یا کارێکی ناپەسەند بەڵکو کەم بەها بوونی فەرمانڕەوایی موسڵ، داری ئەم ئالایەی سست کردبوو و بەمشێوەیە کاروباری موسڵ گرنگی پێنەدرا.

خالید بەم هۆنراوەیە ئارام بوویەوە.

لەم ساڵەدا ڕەشید جەنگی هاوینەی ئەنجامدا و مەئمونی وەك جێگری خۆی لەڕەققە دانا و کاروبارەکانی بەو سپارد. فەرمانی بۆ سەرزەمینەکانی دەوروبەر نووسی و بۆ پیرۆزی ئەنگوستیلەکەی مەنسوری پێدا. نەخشی سەر ئەنگوستیلەکەی ئەمە بوو: ((الله ثقتی آمنت به.))

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر عەین زەربا و کەنیسەی ڕەش و تالآنییەکانیان کۆکردەوە بەلآم خەڵکانی مەسیسە تالآنییەکانیان لەوان سەندەوە.

ئەسەد کوڕی عەمرۆ کوڕی عامر باوکی مونزەری بوجلی کوفی قوتابی باوکی حەنیفە مرد.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك کە لەرافیقە زیندانی بوو، لەمانگی مورحەم لەتەمەنی حەفتا ساڵی ماڵئاوایی لەجیهان کرد. عومەر کوڕی عەلی کوڕی عەتا کوڕی موقەدەمی موقەدەمی بەسری لەم ساڵەدا مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و یەکی کۆچی ( ٨٠٦ زایینی )

شۆڕشی خەڵکانی تۆڵدۆ ( ڕووداوی کەندە)

لەم ساڵەدا حەکەم کوڕی هوشام پاشای ئاندۆلۆس هێرشی کردە سەر خەڵکانی تۆڵدۆ و خوێنی زیاتر لەپێنج هەزار کەس لەسەرکردەکانی ڕشت.

هۆکاری ئەم هێرشە ئەوە بوو خەڵکانی تۆڵدۆ سەرکردەکانی خۆیان یەك لەدوای یەك لەسەر کار لادەبرد و لەبەر ئەوەی دیارەکەی ئەوان قەڵایەکی بەهێزی بوو، بەهێز و خەڵکەکەی بەتوانا بوون، ورەیان بەرز و لەکەس نەدەترسان و بەشێوەی پێویست فەرمانبەری فەرمانی فەرمانڕەواکانیان نەدەکرد. کاتێك حەکەم لێکۆڵینەوەی لەکارەکانی ئەوان کرد، بیری لەفێڵێك کردەوە بۆ ئەوەی بەسەریاندا زاڵ ببێت. بۆ ئەم مەبەستە داوای هاوکاری لەعەمروس کوڕی یوسف کرد کە بەبەرهەمهێن ناودار بوو. عەمروس لەم کاتەدا فەرمانی لەحەکەم دەبرد و خەڵکانی بۆ فەرمان بردن لەو هاندەدا. حەکەم پشتی پێ دەبەست. عەمروس زادەی وەشفە (اوسکا) بوو. حەکەم بانگی کرد و ئامادە بوو. ڕێزی لەعەمروس گرت و ئەوی لەمەبەستەکەی خۆی بۆ سەرکوت کردنی خەڵکانی تۆڵدۆ ئاگادار کردەوە و بۆ ڕێگەچارە ڕاوێژی لەگەڵ کرد و مژدەی فەرمانڕەوایەتی تۆڵدۆی پێدا. حەکەم نامەیەکی بۆ خەڵکانی ئەو دیارە نووسی: فلان کەسم بۆ فەرمانڕەوایەتی ئێوە هەڵبژارد، ئەو لەخۆتانە تا بەمشێوەیە ئارام و لەدەوری کۆببنەوە. ناسازگاری ئێوە لەگەڵ سەرکردە و فەرمانداراەکانتان لەبەر چاو ناگرم تا چاکەخوازی خۆتان بۆ ئێمە بسەلمێنن.

عەمروس ڕۆشتە تۆڵدۆ و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و بڕوایان پێکرد و تۆوی چاکەکارییان چاند. یەکەم فریوی عەمروس هاوڕێیەتی ئەوان دژی منداڵەکانی ئومەییە و سەرپێچی لەفەرمانەکانی ئەوان بوو. ئەوان زیاتر لەدەوری کۆبوونەوە و زیاتر بڕوا و متمانەی ئەوانی بەدەست هێنا. عەمروس پێی وتن: هۆکاری خراپی نێوان ئێوە و پاشا، تێکەڵ بوونی ئێوە لەگەڵ ئەوانە، بەباشی دەزانم بۆ هاوڕێیەتی ئێوە بناغەی کۆشکێك دابرێژم و خۆم و هاوەڵانی پاشا لەوێ

بژین تا تێکەڵ بەئێوە نەبن ( نەبنە هۆکاری ئاژاوە). خەڵکان رازی بون. عەمروس لەناوەڕاستی شار کۆشکێکی بەرز کردەوە.

دوای ئەم رووداوە حەکەم بۆ کارگوزاری خۆی لەسنوورەکانی ئاغازین بەشێوەیەکی نهێنی پەیامی نارد تا نامەیەکی بۆ بنووسێت و لەسوپای ناباوەڕان ئاگاداری بکاتەوە و داوای هاوکاری بکات. کارگوزاری حەکەم ئەو کارەی کرد. حەکەم لەهەر سوچ و قوژبنێکەوە سوپای رازاندەوە و کوڕەکەی خۆی عەبدولرەحمانی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد و فەرماندە و وەزیرەکانی خۆی کردە هاورێی. سوپا بەرێکەوت و لەرێگە گەیشتە تۆلدۆ. عەبدولرەحمان نەڕۆشتە ناو تۆلدۆ و مەرزبان بەفێڵ نامەیەکی بۆ نووسی کە لەدەرەوەی شارەکە خێوەتی هەڵدا بوو: سپاس بۆ خوا ناباوەڕان بلاوەیان لێکردووە و خواوەند رێگەی خراپەکاری لێگرتن. عەبدولرەحمان مەبەستی ئەوەی کرد بۆ کوردوبا بگەرێتەوە کەعەمروس بەخەڵکانی تۆلدۆی دەوت: دەبینن کوڕی حەکەم لێرە دابەزیوە و ناچاری کردووم بڕۆمە بارەگاکەی و بەشێوەی پێویست، دەبێت رێزی لێ بگرم، ئەگەر لەگەڵ من بێن، باشترە وەگەرنە خۆم بەتەنیا دەڕۆم. سەرکردەکانی تۆلدۆ هاورێیەتیان کرد و ڕۆشتنە لای عەبدولرەحمان. ئەو رێزی لێگرتن و بەرواڵەت پێگەی ئەوانی بەرز نرخاند.

حەکەم لەگەڵ کوڕەکەی خۆی، خزمەتکارێکی ناردبوو. خزمەتکار هەڵگری نامەیەکی نهێنی بۆ عەمروس بوو. خزمەتکار ڕۆشتە لای عەمروس، دەستی گوشی و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، نامەکەی پێدا. عەمروس کاتێك نامەکەی خوێندەوە، هەستی بەفێڵەکەی حەکەم سەبارەت بەخەڵکانی تۆلدۆ کرد. ئەو پێشنیاری بەسەرکردەکانی تۆلدۆ کرد داوا لە عەبدولرەحمان بکەن بڕواتە ناو تۆلدۆ تا خەڵکەکەی هێز و گەورەیی سوپاکەی ببینن. ئەوان گومانیان کرد عەمروس چاکەی ئەوانی دەوێت و بەمشێوەیە بەگشتی داوایان لە عەبدولرەحمان کرد بڕواتە ناو شارەکەیان. عەبدولرەحمان ڕۆشتە ناو تۆلدۆ و لەکۆشکی عەمروس مایەوە. خەڵکانی تۆلدۆ دەستە دەستە دەهاتنە سەردانی و سلاویان بۆ دەنارد.

عەمروس بلاوی کردەوە کە عەبدولرەحمان دەخوازێت میوانییەکەی گەورە و

ڕێزدارانە بگرێت. خۆی کاروباری تایبەت بەم میوانییەی دەست پێکرد، ڕۆژێکی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرد. ئەو میوانییەکەی بەمشێوەیە ڕێکخست بۆ ڕێگرتن لەقەرەباڵغی، بانگێشتکراوەکان لەدەرگایەك بڕۆنە ژوور و لەدەرگایەکی دیکە بڕۆنەدەر. ئەوان ڕازی بوون.

لەڕۆژی دیاریکراو، خەڵکان دەستە دەستە هاتن. هەرکات دەستەیەك دەهاتنە ناو، ئەوانیان دەبردە سوچێکی کۆشکەکە و تەسلیم بەژمارەیەك لەسوپاییەکانیان دەکرد. سەربازەکان یەك یەك میوانەکانیان سەردەبڕی و دەیانخستە ناو چاڵ. نزیك نیمەڕۆ، میوانێك هات بەڵام کەسی نەبینی. پرسی: میوانەکان لەکوێن؟ وەڵامیان دایەوە: لەم دەرگاوە دەڕۆنە ژوور و لەو دەرگاوە دەڕۆنەدەر. وتی: هیچ کام لەوانم نەبینی. بەمشێوەیە لەڕووداوەکە ئاگادار بوویەوە و هاواری کرد و خەڵکانی لەکوژرانی هاوەڵانی خۆی ئاگادار کردەوە و ئەمەیش بووە هۆکاری ڕزگار بوونی کەسانی تر. بەڵام ڕزگاربووان ملکەچی خۆیان نیشاندا و لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایی حەکەم و کوڕەکەی بیریان لەنافەرمانی نەکردەوە. هێدی هێدی ژمارەی ئەم کەسە زیان دیتووانە زیادی کرد و کاتێك عەبدولرەحمان چاوی لەجیهان بەست و محەممەدی کوڕی لەسەر تەخت دانیشت، بەپەلە (وەك ئاماژەی پێدەدرێت) لەسەر تەخت هێنایانە خوار.

## یاخیگەری خەڵکانی ماردە لەبەرابەر حەکەم و هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ خەڵکانی کوردویا

لەم ساڵەدا ئەسبەغ کوڕی عەبدوالله ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و دانیشتووانی ئاندۆلۆسی ماردە دژی حەکەم لەدەوری کۆبوونەوە و کارگوزاری حەکەمیان لەشارەکە دەرکرد. حەکەم ئاگادار بوویەوە و ڕێگەی ماردەی گرتەبەر و گەمارۆی خستەسەر. لەگەرماوگەرمی ئەم گەمارۆیە ئاگاداریان کردەوە خەڵکانی کوردویا شۆڕشیان کردووە. بەخێرایی گەڕایەوە و لەماوەی سێ ڕۆژ خۆی گەیاندە ئەو شارە. ئاژاوەچییەکانیان ناسی و سەرەوخوار لەخاچیاندان. دەستەیەکیان

سەربڕی. بەمشێوەیە کەسانی دیکە بیریان لەشۆڕش نەکردەوە بەڵام تۆوی کینەیان لەدڵدا چاند.

خەڵکانی ماردە تاساڵی ٨٠٧/١٩٢ زایینی، هەندێ کات ملکەچی خۆیان نیشان دەدا و هەندێ کات ئاڵای شۆڕشیان بەرز دەکردەوە تا ئەوەی هێزی ئەسبەغ کەمی کرد چوونکە حەکەم بەردەوام سوپای بۆ جەنگی ئەو دەنارد. حەکەم بەنهێنی ڕێزی لەدەستەیەك لەسەرکردەکانی ماردە و هاوەڵانی ئەسبەغ گرت و پێشنیاری پەیوەست بەخۆی و دووری لەئەسبەغی پێکردن. ئەوان لەئەسبەغ و براکەی دوور کەوتنەوە. ئەسبەغ سەرگەردان مایەوە و لەبەر ئەمە داوای ئەمانی کرد و حەکەم ئەمانی پێ بەخشی. ئەو ماردەی بەجێهێشت و لەکوردوبا لای حەکەم نیشتەجێ بوو.

## شەڕی فەرەنگییەکان لەگەڵ خەڵکانی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا لۆزریق (ڕۆدریگ) پاشای فەرەنگییەکان بۆ جەنگ لەگەڵ ئاندۆلۆسییەکان سوپای ڕازاندەوە و هێزەکانی خۆی تەیار کرد تا گەمارۆ بخاتە سەر شاری تورتوسا. حەکەم ئاگادار بوویەوە و سوپاکەی ئامادە کرد و بەفەرماندەیی عەبدولرەحمانی کوڕی سوپایەکی گەورەی بەرێخست. دەستەیەکی فراوان لەپێشەنگەکان پەیوەستی بوون و بەرێکەوتن. ئەوان پێش ئەوەی فەرەنگییەکان بتوانن خۆیان لەسەرزەمینی موسوڵمانان نزیك ببنەوە، لەدەوروبەری شارەکە ڕووبەڕوویان بوونەوە و ئاگری جەنگێکی مەترسیداریان هەڵگیرساند. هەر دوو سوپا هەموو هێز و توانای خۆیان بردە گۆڕەپانی جەنگ. پەروەردگار هاوکاری خۆی بەموسوڵمانان بەخشی و ناباوەڕان شکستیان خوارد، ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا و ژمارەیەکی زۆریان گرفتار بوون. سامانەکانیان تاڵان کرا و موسوڵمانان لەگەڵ تاڵانییەکان گەڕانەوە.

## شۆڕشی حەزم دژی حەکەم

لەم ساڵەدا حەزم کوڕی وەهب لەکەنارەکانی باجە ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستەیەك هاوڕێیەتیان کرد. ئەوان ڕێگەی لشبۆنەیان (لیسبۆن) گرتەبەر. حەکەم لەنامەکانی خۆی حەزمی بەنەبتی ناو دەبرد. کاتێك حەکەم لەشۆڕشەکەی ئاگادار بوویەوە، هوشامی کوڕی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو نارد. هوشام، حەزم و هاوڕێکانی ریسوا کرد و دارەکانی ئەو ناوچەی لەڕەگ و ریشەوە دەرهێنا. بارودۆخی لەوان دژوار کرد تا ئەوەی داوای ئەمانیان کرد و هوشام ئەمانی پێ بەخشین.

## لابردنی عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان لەخوراسان و هاتنە سەرکاری هەرسیمە

لەم ساڵەدا ڕەشید، عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهانی لەفەرمانداری خوراسان لابرد. هۆکاری ئەم فەرمانە کوژرانی عیسای کوڕی بوو کەپێشتر باسمان کرد. کاتێك کوڕەکەی عەلی کوڕی عیسا کوژرا، باوك بۆ مەرگی کوڕەکەی بەئاشکرا فرمێسکی لەچاو دەباراند و لەبەڵخ ڕۆشتەدەر لەترسی ئەوەی نەکا رافیع کوڕی لەیس بۆ گرتنی ئەو شارە بەرێکەوێت. عیسای کوڕی لەباخێك لەماڵەکەی خۆی، سامانێکی زۆر و زەبەندەی لەژێر خاکدا داشاردبوو کەدەڵێن سی هەزار (دینار یا درەم) بووە. جگە لەکەنیزەکەی خۆی کەسی لێ ئاگادار نەکردەوە تەنانەت باوکیشی. کاتێك عەلی کوڕی عیسا ڕۆشتە مەرو، ئەو کەنیزە چەند خزمەتکارێکی لەم نهێنییە ئاگادار کردەوە بەمشێوەیە گەنجینەکەی ئەو بوو بەوێردی سەر زاران و دەستەیەك خۆیان گەیاندە ئەو باخە و گەنجەکەیان ڕفاند. ڕەشید لەدزینی گەنجەکە ئاگادار بوویەوە. وتی: بێ مۆڵەتی من بەڵخی بەجێهێشت و ئەم گەنجینەی لەدوای خۆی دانا لەکاتێکدا وا دەهاتە بەرچاو بۆ جەنگ لەگەڵ رافیع زێر و زیوی هاوسەرەکانی فرۆشتبێت. ڕەشید ئەوی لابرد و هەرسیمە کوڕی ئەعیەنی لەجێگەی ئەو دانا.

یەکێك لەهۆکارەکانی تورە بوونی ڕەشید لەعیسا کوڕی ماهان ئەو هەواڵانە بوو کەسەبارت بەخراپەکاری ئەو لەگەڵ کەسە دیارەکان بەڕەشید دەگەیشت.

ڕۆژێك حسەین کوڕی موسعەب باوکی تاهیر کوڕی حسەین (بکوژی خەلیفە ئەمین) و هوشام کوڕی فەرخوسرەو ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی عیسا و سڵاویان لێکرد. ئەو بەحسەینی وت: سڵاوت لێ نەبێت ئەی ناباوەڕی ناباوەڕ زادە! سوێند بەخوا لەدوژمنی تۆ بۆ ئیسلام ئاگادارم و دەزانم دەخوازیت زیان لەم دینە بدەیت. بۆ کوشتنی تۆ تەنیا چاوەڕوانی فەرمانی خەلیفەم. ئایا لەمماڵەدا عەرەقت نەخوارد و مەست نەبوویت و بڵاوت نەکردەوە کەچەندین نامەت بەدەست گەشتووە کە بەهۆیانەوە من لەسەر کار لابراوم؟ بڕۆدەر، هیواردارم تورەیی و نفرینی خوا هاورێت بێت. حسەین داوای بەخشینی کرد و عەلی کوڕی عیسا رازی نەبوو. فەرمانیدا دەریبکەن.

دواتر بەهوشام کوڕی فەرخوسرەوی وت: ماڵەکەی تۆ بۆتە شوێنی پیلان گێڕان و نەزانەکان لەدەورت کۆدەبنەوە و خراپەی کارگوزارەکانی من دەهێننە سەرزمان. خواوەند بمکوژێت ئەگەر نەتکوژم. ئەویش داوای بەخشینی کرد بەڵام کوڕی عیسا رازی نەبوو.

حسەین رووی کردە دەرگای ڕەشیدو داوای پەنای کرد. سکاڵای لەعەلی کوڕی عیسا کرد. ڕەشید پەنایدا. هوشام ڕۆشتە لای کچەکەی خۆی و پێی وت: دەترسم عەلی کوڕی عیسا خوێنم برێژێت. هەنووکە نهێنییەك لای تۆ دەدرکێنم ئەگەر باسی بکەیت دەبێتە هۆکاری مردنم و ئەگەر بەنهێنی بیهێڵیتەوە، لەمەرگ ناترسم. کچەکەی وتی: چییە؟ هوشام وتی: دەمەوێت وا نیشان بدەم گرفتاری نەخۆشی لاوازی ئەندام بووم. بۆ بەیانی کەنیزەکان بێنە و وەرە سەر جێگەکەی من، تەکانم بدە و کاتێك بینیت بەدژواری تەکان دەخۆم، هاوریێ لەگەڵ کەنیزەکان بقیژێنە و براکانیشت کۆبکەرەوە و لەنەخۆشییەکەم ئاگاداریان بکە. کچی بیرمەند فەرمانەکەی باوکی جێبەجێ کرد. هوشام بێ جووڵە لەجێگەدا کەوتبوو تا هەرسیمە فەرمانڕەوایی گرتەدەست. لەم کاتەدا بۆ بینینی هەرسیمە سوار لەسەر چوارپێ بەرێکەوت. عەلی کوڕی عیسا لەرێگەدا ئەوی بینی و پرسی: بۆ کوێ

دەڕۆیت؟ هوشام وتی: بۆ سەردانی باوکی حاتەمی فەرمانڕەوا. عەلی کوڕی عیسا پرسی: مەگەر نەخۆش نەبوویت؟ هوشام وتی: پەروەردگاری جیهان لەیەك شەودا تەندروستی بۆ گەڕاندمەوە و ستەمکاری لەسەر تەخت هێنایە خوار. بەمشێوەیە فەرمانڕەوایی هەرسیمە ئاشکرا بوو.

دەگێڕنەوە فەرمانڕەوایی هەرسیمە نهێنی بوو. ڕەشید کەسی لێ ئاگادار نەکردەوە. وتوویانە: کاتێك ڕەشید مەبەستی لابردنی عەلی کوڕی عیسای کرد، هەرسیمەی بانگ کرد و بەشێوەیەکی نهێنی لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە و پێی وت: عەلی کوڕی عیسا نامەیەکی بۆ نووسیوم و داوای سوپا و پارەی کردووە، لای خەڵکان وا نیشان بدە بۆ هاوکاری کردنی دەڕۆیت. ڕەشید بەدەستی خۆی نامەی فەرمانڕەوایەتی ئەوی نووسی و فەرمانی بەدەبیرەکاندا نامە بۆ عەلی کوڕی عیسا بنووسن کەخەلیفە، هەرسیمە کوڕی ئەعیەنی بۆ هاوکاری تۆ ڕەوانە کردووە.

هەرسیمە بەڕێکەوت وکەس ئەم نهێنییەی نەدەزانی. کاتێك گەیشتە نەیشابوور، کەسانی خۆی وەك کارگوزاریی ئاوەدانییەکانی ئەو ناوچانە دیاریکرد و خۆی خێراتر لەگەیشتنی ئەم هەواڵە، ئەسپی تاودا و خۆی گەیاندە مەرو. عەلی کوڕی عیسا پێشوازی لێکرد، هەرسیمە ڕێزی گرت تا ئەوەی ڕۆشتە ناو شارەکەی. لەم کاتەدا عەلی کوڕی عیسا و کەسان و شوێنکەوتەکانی دەستبەسەر کرد و سامانەکانی ئەوی زەوت کرد کەنزیکەی هەشتا هەزار هەزار (دینار یا درەم) بوو. گەنج و کەرەستەکانی جەنگی ئەو باری هەزار و پێنسەد وشتر کرا و ڕەشید داوای ئەم سامانەی کرد. هەرسیمە لەساڵی ٨٠٧/١٩٢ زایینی گەیشتە خوراسان. کاتێك هەرسیمە دەستی بەسەر سامانەکاندا گرت، سەرقاڵی وەرگرتنی سامانی خەڵکان لەوان بوو. هەواڵەکانی بۆ ڕەشید نووسی و عەلی کوڕی عیسای سوار وشترێکی بێ کۆپان کرد و ڕەوانەی دەرباری خەلیفەی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا شۆڕشگێڕێکی خارجی بەناوی سەروان کوڕی سەیف لەکەنارەکانی حەولایا ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و بۆ ناوچەکانی دەوروبەری عێراق هەڵات. تەوق کوڕی مالك بۆ سەرکوتی ئەو ڕەوانە کرا بەڵام شکستی بەتەوق هێنا و برینداری کرد و شەڕکەرانی سوپاکەی کوشت.

لەم ساڵەدا باوکی نەدا لەشام شۆڕشی کرد و ڕەشید، یەحیا کوڕی موعازی بۆ لای ئەو نارد و فەرمانڕەوایەتی شامی پێ سپارد.

هەروەها لەم ساڵەدا حیمادی بەربەری دەستی بەسەر بەهەیسەمی یەمانیدا گرت.

لەم ساڵەدا دانیشتووانی نەسەف نامەیان بۆ رافیع کوڕی لەیس نووسی و داوایان لێکرد کەسێك بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە بکات تا گیانی عیسا کوڕی عەلی کوڕی عیسا و عەلی کوڕی عیسا بگرن. رافیع سوپایەکی بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە کرد و توانییان لەمانگی زیقەعدە تەنیا عیسا بکوژن.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی مەخلەدی هوبەیری لەگەڵ دە هەزار شەڕکەر، بۆ جەنگی ڕۆمییەکان بەرێکەوت. ڕۆمییەکان ڕێگەی دۆڵەکانیان لێگرت و خۆی و پەنجا شەڕکەری دیکەیان کوشت. شەڕکەرانی دیکە بێ زیان درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا. شوێنی ئەم ڕووداوە دوو مەنزڵ پێش تەرسوس بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕەشید، هەرسیمە کوڕی ئەعیەنی پێش ڕەوانە کردنی وەك فەرمانڕەوای خوراسان بۆ جەنگی هاوینە نارد. سی هەزار شەڕکەری خوراسانی لەژێر فەرمانی ئەودا بوو. ڕەشید عەبدوالله کوڕی مالکی وەك فەرمانڕەوای دەرب ئەلحەدەس و سەعید کوڕی سەلەم کوڕی قوتەیبەی وەك فەرمانڕەوای مەرعەش دیاریکرد. لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان و تالآنییان دەست کەوت و گەڕانەوە. سەعید کوڕی سەلەم لەوێ نەجووڵا. ڕەشید، محەممەد کوڕی یەزید کوڕی مەزیدی بۆ تەرسوس ڕەوانە کرد.

ڕەشید سێ ڕۆژ لەدەرب ئەلحەدەس لەمانگی رەمەزان مایەوە و دواتر

گەڕایەوەبۆ ڕەققە. فەرمانی وێران کردنی کەنیسە سنوورییەکانی دەرکرد. ئەو ئەهلی زەممەی (ناموسوڵمانە باجدەرەکان) ناچار کرد جل و بەرگی تایبەت لەبەر بکەن و سوار چوارپێی تایبەت (کەر) بن. ڕەشید فەرمانیدا بناغەی تەرسوس وەك شارێك دابرێژن. فەرمانبەران فەرمانەکەیان ئەنجامدا. بەڕێوبەری ئەم ساخت و سازە، فەروخی خزمەتگوزار بوو. ئەو سی هەزار شەڕکەری خوراسانی لەوێ نیشتەجێ کرد و دواتر هەزار کەسی دیکە لەخەڵکانی مەسیسەی بردە ئەوێ و هەزار کەسی دیکە لەدانیشتووانی ئەنتاکییەی لەوێ جێگە کردەوە. دروست کردنی ئەم شارە لەساڵی ١٩٢/٨٠٧ زایینی کۆتایی پێهات. فەروخ مزگەوتی شارەکەی دروست کرد.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی فەرمانڕەوای مەککە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. محەممەد کوڕی فەزڵ کوڕی سلێمان فەرمانڕەوای موسڵ بوو.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی موسای سینانی باوکی عەبدوللەی مەروزی موالی منالەکانی قوتەیعە کۆچی دووای کرد. ئەو لەساڵی ١١٥/٧٣٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و دووی کۆچی ( ٨٠٧ زایینی )

### ڕۆشتنی ڕەشید بۆ خوراسان

لەم ساڵەدا ڕەشید کەنەخۆش بوو لەبەغدادەوە ڕێگەی ڕەققەی گرتەبەر تا لەوێوە بۆ جەنگ لەگەڵ رافیع کوڕی لەیس بەرەو خوراسان بەرێکەوێت. ئەو قاسمی کوڕی وەك جێگری خۆی لەڕەققە دەستنیشان کرد و خەزیمە کوڕی خازمی کردە راوێژکاری ئەو. لەپێنجی مانگی شەعبان رووی کردە رێگەی نەهرەوان و ئەمینی کوڕی وەك جێگری خۆی لەبەغداد دانا و فەرمانی بەمەئموندا لەبەغداد بمێنێتەوە. ئەو کاتەی ڕەشید رێگەی خوراسانی گرتەبەر، فەزڵ کوڕی سەهل بەمەئمونی وت: دەزانی ڕەشید چی بەسەر دێت؟ خوراسان سنووری فەرمانڕەوایەتی تۆیە و محەممەد ئەمین لەپێش تۆیە. باشترین کاری ئەوان بەرابەر بەتۆ ئەوەیە پەراوێزت بخەن چوونکە ئەو منالی زوبەیدە و خاڵۆکانی لەمناڵەکانی هاشمە و زوبەیدە و سامانەکەی بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی ئەو بەکار دەبرێت. داوا لەسەروەری باوەڕداران بکە تۆ لەگەڵ خۆی ببات. مەئمون داوای لەڕەشید کرد هاورێیەتی بکات و ڕەشید هەرچەند سەرەتا رازی نەبوو، دواتر ئەوی لەگەڵ خۆی برد.

سەباحی تەبەری هاورێیەتی ڕەشیدی دەکرد. ڕەشید پێی وت: ئەی سەباح! چیتر گومان ناکەم بمبینیت (مەبەستی نەخۆشییەکەی بوو). سەباح لەخوا پاڕایەوە. ڕەشید وتی: گومان ناکەم هەست بەئازارەکەم بکەیت. سەباح وتی: نا، سوێند بەخوا نازانم. ڕەشید لەرێگە لایدا و لەژێر سێبەری دارێك وچانی گرت. فەرمانیدا و کەسەکانی لەخۆی دوور کردەوە و سکی خۆی دەرخست. ورگ بەندێکیان لێ بەستبوو، وتی: ئەمەیە ئەو نەخۆشییەی لەهەموان دەیشارمەوە. هەرکام لەمناڵەکانم سیخورێکیان بۆ من داناوە. مەسرور سیخوڕی مەئمونە و جبرائیل کوڕی بەختیشوع سیخوڕی ئەمین. ئەوان هەناسەکانی من دەبژێرن و ئارەزووی مەرگی من دەکەن. ئەگەر دەخوازی گومانت لەمبارەوە نەمێنێت،

هەرئێستا داوای چوارپێیەك دەكەم و دەبینی چوارپێیەكی لەڕ و لاوازم بۆ دێنن تا نەخۆشییەكەی من پەرە بستێنێت. ئەم نهێنییە لای كەس مەدركێنە. سەباح داوای تەندروستی بۆ كرد. ڕەشید داوای چوارپێیەكی كرد. چوارپێیان بۆ هێنا بەهەمان شێوە كەپێشبینی كردبوو. ڕەشید سەیری سەباحی كرد و سوار بوو.

## بیركردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا خوڕەم دینەكان لەئازەربایەجان كەوتنە جموجۆڵ. ڕەشید عەبدوالله كوڕی مالكی لەگەڵ دە هەزار سەرباز بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە كرد. ئەو كوشتاری كرد، ئەسیری گرت و وێرانی هێنایە ئاراوە. لەكرمانشان پەیوەستی ڕەشید بوو. ڕەشید فەرمانی پێدا خوێنی ئەسیرەكان برێژێت و ژنان و منالە دیلەكان بفرۆشێت.

لەم ساڵەدا یەحیا كوڕی موعاز، باوكی نەدای بردە لای ڕەشید و ڕەشید خوێنی ڕشت.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەفەرماندەكان لەرافیع كوڕی لەیس جیابوونەوە و پەیوەستی هەرسیمە بوون. عوجەیف كوڕی عەنبەسە لەناو ئەواندا دەبینرا.

لەم ساڵەدا ڕەشید، سابت كوڕی نەسر كوڕی مالكی وەك سنووردار دیاریكرد و ئەو دەستی بەسەر مەتمورەدا گرت.

لەم ساڵەدا بەهای ئازادی ئەسیرەكان لەبەزندون درا.

لەم ساڵەدا سەروانی حەروری لەتف ی بەسرە ئاڵای شۆڕشی بەرز كردەوە و لەگەڵ كارگوزاری خەلیفە جەنگی.

لەم ساڵەدا عیسا كوڕی جەعفەر كوڕی مەنسور لەدەسكەرە مرد. ئەو دەیویست پەیوەستی ڕەشید ببێت.

لەم ساڵەدا ڕەشید هەیسەمی یەمانی كوشت. عەباس كوڕی عەبدوالله كوڕی جەعفەر ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا هەرسیمە گەیشتە خوراسان و لەسەمەرقەند گەمارۆی خستە سەر رافیع كوڕی لەیس. ئەو تاهیر كوڕی حسەینی بۆ لای خۆی بانگ كرد. خوراسان

هێزی تیا نەما و حەمزەی خارجی ڕۆشتە ناو شارەکە و تا توانی خوێنی ڕشت و سامانەکانی کۆکردەوە. کارگوزارەکانی هەرات و سەجستان باجیان بۆ دەنارد تا ئەوەی عەبدولرەحمانی نەیشابووری لەگەڵ بیست هەزار سەرباز ڕووبەرووی بوویەوە. لەنێوان ئەم دوو سوپایە جەنگێکی قورس ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی حەمزە کوژران. عەبدولرەحمان شوێن حەمزە کەوت و

گەیشتە هەرات. ئەم ڕووداوە لەساڵی ١٩٤/٨٠٩ زایینی ڕوویدا. مەئمون فەرمانی گەڕانەوەی بۆ نارد. هەرسیمە درێژەی بەگەمارۆکەی سەر سەمەرقەند دا و سەرئەنجام دەستی بەسەردا گرت. (بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین). ئەو ڕافیع کوڕی لەیس و ژمارەیەك لەکەسە نزیکەکانی دەستبەجێ کوشت و کوڕی یەحیای وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دیاریکرد و گەڕایەوە. کوژرانی ڕافیع لەساڵی ١٩٥/ ٨١٠ زایینی ڕوویدا.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی ئیدریس کوڕی یەزیدی ئەودی کوفی و یوسف کوڕی باوکی یوسفی قازی مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا بەهای ئازادی لەنێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان ئاڵ و گۆڕ کرا. بەرێوبەری ئەم ئاڵ و گۆڕە سابت کوڕی نەسر کوڕی مالکی خوزاعی بوو. ژمارەی ئەسیرەکان دوو هەزار و پێنسەد کەس بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و سێی کۆچی ( ٨٠٨ زایینی )

### مەرگی فەزڵ کوڕی یەحیا

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك لەزیندانی ڕەققە مرد. هۆکاری مردنەکەی ئەوە بوو زمانی قورس و چەناکەی لەجووڵە کەوت. چەندین مانگ دەرمانیان کرد و سەرئەنجام چاك بوویەوە. بەردەوام دەیوت: حەز ناکەم ڕەشید پێش من بمرێت چوونکە بەسەرهاتی من پەیوەندی بەکارەکانی ئەو هەیە.

کاتێك لەنەخۆشییەکەی رزگاری بوو و توانی قسە بکات، نەخۆشییەکەی جارێکی دیکە دەستی پێکردەوە، توانای قسە کردنی نەماو چەناکەی ژێرەوەی بەتەواوی لەجووڵە کەوت و لەموحەرەمدا کۆچی کرد. براکانی نوێژیان لەسەر جەنازەکەی خوێند. ئەوانیش لەگەڵ ئەودا زیندانی بوون. دواتر جەنازەکەی لەکۆشك برایەدەر و خەڵکان نوێژیان لەسەر خوێند و گریان. پێنج مانگ پێش ڕەشید و لەتەمەنی چل و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. فەزڵ بەرادەیە چاکەکار بوو لەجیهاندا ناتوانین کەس بەهاوتای ئەو بزانین.

لەم ساڵەدا جەنازەی سەعیدی تەبەری ناسراو بەجەوهەری، بەخاك سپێردرا.

هەروەها لەم ساڵەدا لەنێوان هەرسیمە و رافیع جەنگ روویدا و لەکۆتاییدا هەرسیمە توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت و دەستی بەسەر بوخارادا گرت و توانی زۆربەی براکانی رافیع بگرێت و ڕەوانەی بارەگای ڕەشیدیان بکات.

### مەرگی ڕەشید

لەسێیەم جومادی الاخر ڕەشید کۆچی دوایی کرد. نەخۆشیی ئەو لەرێگەی جەرجان تەشەنەی سەند. خۆی گەیاندە توس و لەوێ خواوەند گیانی گرت.

جبرائیل کوڕی بەختیشوع دەڵێت: لەڕەققە هاورێیەتی ڕەشیدم دەکرد. هەموو بەیانییەك یەکەم کەس من دەڕۆشتمە لای. بەرەبەیانان کەدەڕۆشتمە لای، لەگەڵم

ئاخاوت و پرسیارە گشتییەکانی پرسی. ڕۆژێك ڕۆشتمە لای، سڵاوم لێکرد.سەیری کردم. پەرێشان و بیرمەند ئەوم هاتە بەرچاو. ماوەیەك وەستام بیٚ ئەوەی قسە بکات. کاتێك بێدەنگی درێژەی کێشا، هەنگاوم بردە پێش و پرسیاری تەندروستیم کرد و هۆکاری پەرێشانیم پرسی. وتی: بیر لەخەوەکەی دویٚ شەوم دەکەمەوە کەبۆتە هۆکاری لێوانلێو بوونی دڵم لەترس. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئاسوودە بووم، دەست و پێی ماچ کرد و وتم: خەو یا زادەی گومانە یا زادەی هەڵمە دروست بووەکان یا زادەی ماملەیە. و ئەوە هیچ شتێك جگە لەخەوە پەرێشانەکان نییە.

ڕەشید وتی: هەنووکە خەوەکەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە: لەخەودا بینیم وەك بڵێی لەسەر تەختەکەی خۆم دانیشتووم، لەناکاو دەستێك لەژێرەوە هات، دەستەکەم دەناسی تەنانەت پەنجەکانیشی بەڵام ئێستا ناوی ئەوم لەبیر کردووە. خۆڵی سووری لەدەستا بوو. دەنگێکم بیست بەڵام بێژەرەکەیم نەدەدی. وتی: ئەمە خۆڵێکە تیایدا دەحەوێیتەوە. پرسیم: ئەم خاکە لەکوێیە؟ وتی: توس. لەناکاو دەستەکە دیار نەما و چیتر دەنگیش بەگویٚ نەگەیشت. وتم: گومان دەکەم پێش خەوتن بیرت لەخوراسان و شۆڕشەکانی ئەو سنوورە کردۆتەوە و ئەمە بۆتە هۆکاری ئەم خەوە.

ڕەشید وتی: ڕاست دەکەیت. پێشنیارم کرد شاد بێت و ئەویش سفرەی بەزم و شادی ڕاخست. هەردووك خەوی ئەو شەوەمان لەبیر کرد. چەندین ڕۆژ تێپەڕی تا ئەوەی ڕەشید بۆ جەنگی ڕافیع ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر. دوای بڕینی بەشێکی ڕێگە، نیشانەکانی نەخۆشی لەڕەشید دەرکەوت. نەخۆشییەکەی گەشەی دەکرد تا ڕۆشتینە ناو توس. لەباخی کۆشکەکەی لەو شارە شەڕی لەگەڵ نەخۆشییەکەی دەکرد. لەناکاو خەوەکەی بیرکەوتەوە و لەجێگەکەی بەرز بوویەوە. بەدژواری توانی خۆی لەسەر پیٚ ڕابگرێت و هەندیٚ جار دەکەوت. هەمووان دەوری ئەومان گرت و پرسیاری حاڵیمان کرد. وتی: خەوەکەی خۆم بیرکەوتەوە. دواتر سەری بەرز کردەوە و بەمەسروری وت: مشتێك لەخۆڵی ئەم باخەم بۆ بێنە. مەسرور مشتیٚ خۆڵی بۆ هێنا. کاتێك ڕەشید خۆڵەکەی بینی، وتی: سوێند بەخوا ئەمە ئەو

دەستەیە لەخەودا بینیم و ئەمە هەمان پەنجەیە و بێ هیچ گومانێك ئەو خۆڵە سوورەیە. دەستی بەگریان کرد و سێ ڕۆژ دوای ئەو مرد.

باوکی جەعفەری تەبەری دەڵێت: کاتێك ڕەشید لەبەغدادەوە ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر، لەمانگی سەفەر گەیشتە جەرجان و نەخۆشییەکەی پەرەی سەند. ڕەشید مەئمونی بۆ مەرو ڕەوانە کرد و چەندین فەرماندەی وەك عەبدوالله کوڕی مالك، یەحیا کوڕی موعان، ئەسەد کوڕی یەزید، عەباس کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس، سندی حەرەشی و نوعەیم کوڕی حازمی کردە هاوڕێی ئەو. ڕەشید گەیشتە شاری توس و نەخۆشییەکەی زیادی کرد و لەپێی خست. کاتێك نەخۆشییەکەی بلاو بوویەوە، خەڵکان بەشێوەیەکی بەربلاو سەبارەت بەو وتەیان هێنایە سەرزمان و ڕەشید ئاگادار بوویەوە. فەرمانیدا و چوارپێیەکیان بۆ هێنا تا خەڵکان ئەو بەسواری ببینن. گوێدرێژێکیان بۆ هێنا بەلام توانای هەستانە سەرپێی نەبوو. لەم کاتەدا وتی: بمگەڕێننەوە، بمگەڕێننەوە سوێند بەخوا خەڵکان ڕاست دەکەن.

ڕەشید لەتوس بوو کەبەشیر کوڕی لەیس برای رافیعیان بردە لای. ڕەشید وتی: سوێند بەخوا ئەگەر توانای قسە کردنم نەمابێت جگە لەیەك وشە، دەڵێم: بیکوژن. جەلادی بانگ کرد و فەرمانی پێدا هەموو ئەندامەکانی بەشیر لەت بەت بکات. کاتێك ئەم کارە کۆتایی پێهات، ڕەشید بێ هۆش بوو و خەڵکان بلاوەیان لێکرد. کاتێك ڕەشید لەچاکبوونەوەی خۆی بێ هیوا بوو، فەرمانیدا گۆڕێکی بۆ هەڵکەنن. لەهەمان کۆشك گۆڕێکیان بۆ هەڵکەند. ڕەشید دەستەیەکی بۆ ناو گۆڕەکە نارد تا قورئانی تیا بخوێنن. ئەوانیش قورئانیان لەسەرەتاوە تا کۆتایی خوێند. ڕەشید لەسەر جێگەیەك لەلێواری گۆڕەکە بوو، دەیوت: ئەی ئادەمیزاد! ئەنجامەکەت ئێرەیە، دەیوت: هاوار لەمن، لای پێغەمبەر(د.خ) چی بڵێم؟

هەیسەم کوڕی عودەی دەڵێت: لەسەرەمەرگدا، ڕەشید بێ هۆش بوو، کاتێك هاتە هۆش، چاوی کردەوە و فەزڵ کوڕی رەبیعی لەسەر سەری خۆی بینی، وتی: ئەی فەزڵ:

احين دنا ما كنت ارجودنوه      رمتنى عيون الناس من كل جانب

فأصبحت مرحوما و كنت محسدا فصبرا على مكروه تلك العواقب

سأبكى على الوصل الذى كان بيننا و اندب ايام السرور الذواهب

واتاكەی: ئایا كاتی كەئەوەی چاوەڕوانم دەكرد، گەیشت، خەڵكان لەهەموو سووچێكەوە چاو دەبڕنە من و دوای ئەوەی هەمووان رژدی بەمن دەبەن، هەنووكە دڵیان بۆ من دەسوتێت، كەواتە بۆ ئەنجامێكی ناپەسەندی لەم شێوە خۆڕاگری پێویستە. بۆ ئەو پەیوەندییەی لەنێوان ئێمەدا بوو، فرمێسك لەچاو دەبارێنم و بۆ رۆژە تێپەڕەكانی شادمانی قاقا دەگریم.

سەهل كوڕی ساعد دەڵێت: كاتێك ڕەشید لەتاو ئازار لەخۆی دەئالآ، لەسەر سەری بووم. راخەرێكی ئەستوری داوا كرد و لەخۆیەوە ئالآند. ئازاری دەكێشا. هەستام. وتی: دانیشە. ماوەیەك دوور و درێژ دانیشتم بێ ئەوەی قسە بكات یا قسە بكەم. دووبارە هەستام. وتی: بۆ كوێ دەڕۆیت ئەی سەهل؟ وتم: ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم سەروەری باوەڕداران بەمشێوەیە ئازار دەكێشێت. ئەگەر سەروەری باوەڕداران، بحەوێتەوە، پەسەندترە. بەشێوەیەك پێكەنی وەك بڵێی نەخۆش نییە. وتی: ئەی سەهل، هەنووكە هۆنراوەی ئەو شاعیرەم بیر كەوتەوە كەدەڵێت:

و انی من قوم كرام يزيدهم شماسا و صبرا شدة الحدثان

واتاكەی: من لەریزی ئەو رێزدارانەم كەسەختی رووداوەكان خۆڕاگری وسەرسەختی ئەوان زیاد دەكات.

بەمشێوەیە ڕەشید مرد و ساڵحی كوڕی نوێژی لەسەر خوێند. فەزڵ كوڕی ڕەبیع و ئیسماعیل كوڕی سەبیح و مەسرور و حسەین لەكاتی مەرگی ڕەشید لای ئەو بوون.

خەلافەتی ئەوبیست و سێ ساڵ و دوو مانگ و هەژدە رۆژ یا بیست و سێ ساڵ و یەك مانگ و شانزە رۆژ، درێژەی كێشا. ساڵەكانی تەمەنی لەچل و حەوت ساڵ و پێنج مانگ و پێنج رۆژ كۆتایی پێهات. ئەو جوان، سپی و قژ لوول بوو. چەند تاڵێكی سپی لەسەریدا دەبینرا. دەڵێن: لەكاتی مەرگ نۆسەد هەزار هەزار (دینار یا درهەم) لەگەنجینەكانیدا دەبینرا.

## کارگوزاری شارەکان لەڕۆژگاری ڕەشید

کارگوزارانی مەدینە: ئیسحاق کوڕی عیسا کوڕی عەلی، عەبدمەلیك کوڕی سالّح کوڕی عەلی، محەممەد کوڕی عەبدوالله، موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا، ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیم، عەلی کوڕی عیسا کوڕی موسا، محەممەد کوڕی ئیبراهیم، عەبدوالله کوڕی موسعەب، بەکار کوڕی عەبدوالله کوڕی موسعەب، محەممەد کوڕی عەلی، باوکی بەختەری وەهب کوڕی مونەبە.

کارگوزارانی مەککە: عەباس کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیم، سلێمان کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمان، موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا، عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیم، عەبدوالله کوڕی قوسەم کوڕی عەباس، عوبەیدالله کوڕی قوسەم، عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عیمران، عوبەیدالله کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیم، عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا، عەلی کوڕی موسا کوڕی عیسا، محەممەد کوڕی عەبدوالله‌ی عوسمانی، حەمادی بەربەری، سلێمان کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمان، فەزلّ کوڕی عەباس کوڕی محەممەد، ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی.

کارگوزارانی کوفە: موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا، محەممەد کوڕی ئیبراهیم، عوبەیدالله کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیم، یەعقوب کوڕی باوکی جەعفەر، موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا، عەباس کوڕی عیسا کوڕی موسا، ئیسحاق کوڕی سەباحی کێندی، موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا، عەباس کوڕی عیسا کوڕی موسا، موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا، جەعفەر کباوکی جەعفەر.

کارگوزارانی بەسرە: محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەلی، سلێمان کوڕی باوکی جەعفەر، عیسا کوڕی جەعفەر کوڕی باوکی جەعفەر، خوزەیمە کوڕی خازم، عیسا کوڕی جەعفەر، جەریر کوڕی یەزید، جەعفەر کوڕی سلێمان، جەعفەر کباوکی جەعفەر، عەبد سەمەد کوڕی عەلی، مالك کوڕی عەلی خوزاعی، ئیسحاق کوڕی سلێمان کوڕی عەلی، سلێمان کوڕی باوکی جەعفەر، عیسا کوڕی جەعفەر، حەسەن کوڕی جەمیل موالی ڕەشید، عیسا کوڕی جەعفەر کوڕی باوکی جەعفەر،

جەریر کوڕی یەزید، عەبدسەمەد کوڕی عەلی، ئیسحاق کوڕی عیسا کوڕی عەلی.

کارگوزارانی خوراسان: باوکی عەباسی توسی، جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس، عەباس کوڕی جەعفەر، غێتریف کوڕی عەتاب، سلێمان کوڕی راشیدی باژیان، حەمزە کوڕی مالك، فەزڵ کوڕی یەحیا کوڕی خالید، مەنسور کوڕی یەزید کوڕی مەنسور، جەعفەر کیەحیا و جێگرەکەی ئەو لەخوراسان عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان، هەرسیمە کوڕی ئەعیەن، عەباس کوڕی جەعفەر بەنوێنەرایەتی مەئمون و عەلی کوڕی حەسەن کوڕی قەحتەبە.

## ژنان و منداڵەکانی ڕەشید

دەڵێن: ئەو لەگەڵ زوبەیدە یا هەمان دایکی جەعفەر کچی جەعفەری مەنسور لەساڵی ١٦٥/ کۆچی/٧٨١ زایینی پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. زوبەیدە محەممەد ئەمینی هێنایە دنیا و لەساڵی ٢٢٦/٨٤٠ زایینی چاوی لەجیهان بەست.

عەزیزی کەنیز، دایکی منداڵ، هادی وەك هاوسەر هەڵبژارد و ئەو عەلی کوڕی ڕەشیدی هێنایە دنیا. ژنێکی دیکەی ئەو دایکی محەممەد کچی ساڵحی مسکین بوو. عەباسە کچی سلێمان کوڕی مەنسور هاوسەری بوو هەروەها عەزیزە کچی خاڵۆی، غێتریفی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

سەرئەنجام لەگەڵ عوسمانییە پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. عوسمانییە کچی عەبدوالله کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەفان و باوەگەورێی باوکی فاتیمە، کچی حسەین کوڕی عەلی بوو.

لەو کاتەی جەنازەی بێ گیانیان بەخاکدا دەسپارد، چوار هاوسەری مارەکراوی بوو: زوبەیدە، دایکی محەممەد کچی ساڵح، عەباسە و عوسمانییە.

کوڕەکانی بریتی بوون لە: محەممەد ئەمین لەزوبەیدە، عەبدوالله مەئمون لەدایکی موراجل، قاسم مۆتەمەن، باوکی ئیسحاق محەممەدی موعتەسەم، ساڵح، باوکی عیسای محەممەد، باوکی یەعقوب محەممەد، باوکی عەباس محەممەد، باوکی سلێمان محەممەد، باوکی عەلی محەممەد. باوکی محەممەد بەناوی باوکی ئەحمەد محەممەد کەهەموویان دایکیان دایکی منداڵ بوو.

کچەکانی بریتی بوون لە: سوکەینە، دایکی حەبیب، ئەروی، دایکی حەسەن، دایکی محەممەد یاهەمان حەمدونە، فاتیمە، دایکی ئەبیها، دایکی سەلمە، خەدیجە، دایکی قاسم، رەملە، دایکی جەعفەر، دایکی عەلی، عالیە، ریتە کەدایکی هەموویان دایکی منالْ بوو.

## بەشێك لەتایبەتمەندییەکانی ڕەشید

دەڵێن: ڕەشید تاکاتی مەرگ، جگە لەکاتی نەخۆشی، رۆژانە سەد رەکعەت نوێژی دەخوێند و لەسامانی خۆی جگە لەزەکات، رۆژانە هەزار درهەمی لەرێگەی خوادا خەرج دەکرد و هەرکات دەڕۆشتە ماڵی خواوەند، سەد کەس لەفەقیە و منالەکانیان هاورێیەتیان دەکرد و هەرکات نەیدەتوانی سەردانی ماڵی خوا بکات، سێسەد کەس بەهەزینەی پێویست و جل و بەرگی خاوێن بۆ تەوافی (سوڕانەوە بەدەوری کەعبە) ماڵی خواوەند ڕەوانە دەکرد.

هەوڵی دەدا پێ بخاتە جێگەی مەنسور جگە لەبەخشش چوونکە بەخشەندەتر لەهارون نەبینراوە و چاکەی چاکەکار لای ئەو بێ وەلاّم نەدەمایەوە و بەخێرایی پاداشتی ئەوی دەدا.

ئەو هۆنراوە و هەڵبەستوانانی خۆش دەویست و رێزی لەبیرمەندان و شارەزایانی دین دەگرت و پاداشتی بەرچاوی بۆ لەبەر چاو دەگرتن.

کاتێك مەروان کوڕی باوکی حەفسە بەم قەسیدەیە وەسفی ئەوی کرد کە:

و سدت بهارون الثغور فاحكمت     به من امور المسلمين المرائر

واتاکەی: سنورەکان بەفەرمانی هارون بەهێز بوون و بەمشێوەیە موسوڵمانان بوێریان پێبڕا.

هارون بۆ ئەم قەسیدەیە پێنج هەزار دینار و پۆششی گرانبایی و دە کۆیلەی رۆمی پێ بەخشی و ئەوی سوار بێرزون، چوارپێ تایبەتەکەی خۆی کرد.

دەڵێن: رەشید بەردەوام لەگەڵ کوڕی باوکی مریەمی مەدینی بوو. ئەو پیاوێکی زمان لووس و گاڵتەچی بوو کەچەندایەتی و چۆنایەتی خەڵکانی حیجاز و نازناوی گەورەکان و فیرت و فێڵی گاڵتەچییەکانی بەباشی دەزانی و ڕەشید بەرگەی دووری

ئەوی نەدەگرت و ئەوی لەکۆشکەکەیدا نیشتەجێ کردبوو. شەوێك ڕەشید ڕۆشتە لای، هێشتا خەوتبوو. ڕەشید لەجێگەکەی ئەو دەستی بەنوێژ خوێندن کرد و تابەرەبەیان بەردەوام بوو. لەم کاتەدا پێخەفەکەی سەر کوڕی باوکی مریەمی لابرد و وتی: شەوت چۆن کردە بەیانی؟ لەوەڵامی ڕەشیددا وتی: هێشتا نەمکردۆتە بەیانی، سەرقاڵی کاری خۆت بە. ڕەشید وتی: هەستە و نوێژ بخوێنە. کوڕی باوکی مریەم وتی: ئێستا کاتی نوێژی باوکی جارودە و من لەهاوەڵانی باوکی یوسفم. ڕەشید بۆ نوێژ وەستا. کوڕی باوکی مریەم هەستا و کاتێك ڕەشید هاتنی ئەوی بینی کە ئەم ئایەی لەنوێژەکەیدا دەخوێند: چیم بەسەر دێت کەئافرێنەری خۆم ناپەرەستم[٧]؟ کوڕی باوکی مریەم وتی؟ سوێند بەخوا منیش نازانم (بۆ نایپەرەستی) ڕەشید نەیتوانی خۆی بگرێت و لەبەر پێکەنین نوێژەکەی بڕی. بەتوڕەییەوە بەکوڕی باوکی مریەمی وت: لەکاتی نوێژیش؟ کوڕی باوکی مریەم وتی: مەگەر من چیم کردوە؟ ڕەشید وتی: نوێژەکەت پێ بڕیم. کوڕی باوکی مریەم وتی: سوێند بەخوا هیچم نەکردووە. تەنیا ئەو وتەم لەتۆ بیست کەمنی خەمبار کرد و بەخۆم وت منیش نازانم بۆ خوا ناپەرەستیت. دووبارە ڕەشید پێکەنی و وتی: لەگاڵتە و قسەی خۆش سەبارەت بەدین و قورئان خۆت بەدوور بگرە جیاواز لەوە هەرچی دەخوازی، بیهێنە سەرزمان.

دەڵێن: یەحیا کوڕی خالید پیاوێکی بۆ کۆکردنەوەی باج دیاریکرد و ئەوی بۆ ماڵئاوایی کردن بۆ بارەگای ڕەشید نارد. یەحیا و جەعفەر لای ڕەشید بوون. ڕەشید بەو دووانەی وت: پێشنیاری پێبکەن. یەحیا وتی: زیادیکە و ئاوەدانی بکە. جەعفەر وتی: دادپەروەری بکەرە پیشە و بەرابەری بپارێزە. ڕەشید وتی: دادپەروەری بڵاو بکەرەوە و چاکەکاری بەجێبێنە.

دەڵێن: ساڵێك ڕەشید بەمەبەستی حەج ڕووی لەمەککە کرد. ڕۆشتە ناو کەعبە. یەکێك لەپەرستارانی کەعبە ئەوی بینی کە لەسەر پەنجەی پێ وەستاوە و دەڵێت: ئەی ئەو کەسەی لەنیازی نیازمەندان و نهێنییەکان ئاگاداری، هەر داوایەك لای تۆ وەڵامێکی ئامادەی هەیە، ئاگایی گشتگیری تۆ هەموو بێدەنگییەك لەخۆ دەگرێت و

---

[٧] یس / ٢٢ ، و مالی لا اعبد الذی فطرنی

نیشاندەری مژدە ڕاستەکان و چاکەکارییە لەپێشەکانی تۆ و ڕەحمەتی تۆیە. سڵاو لە پێغەمبەر(د.خ) و بنەماڵەکەی بکە و لەگوناحەکانی ئێمە خۆشبە و خراپەکانمان بشارەوە، ئەی ئەو کەسەی گوناحی گوناحکاران زیانت لێ نادات و نهێنییەکان لای تۆ شاراوە نییە، ئەی ئەوکەسەی زەویت لەسەر ئاو جێگیر کردووە و هەوات بەئاسمان داپۆشیوە و جوانترینی ناوەکانت بۆ خۆت هەڵبژاردووە، سڵاوی ئێمە بە محەممەد و بنەماڵەکەی بگەیێنە و چاکەکانی خۆت بەمن ببەخشە. ئەی ئەو کەسەی دەنگەکان بۆ تۆ دەستەمۆ و خەڵکان بەزمانە جۆراوجۆرەکان داوای نیازەکانی خۆیان لەتۆ دەکەن، لەنیازەکانی من یەکیان ئەوەیە لەکاتی مەرگ و خەوتن لەناو گۆڕ و ڕۆشتنی کەسەکانم لای ئارامگاکەم، لەگوناحەکانی من چاوبپۆشە. خواوەندا! بێ کۆتا سپاس و ستایشی تۆ دەکەین. خواوەندا! بەشێوەیەك سڵاوی محەممەد و بنەماڵەکەی بگەیێنە ڕەزامەند ببێت و پاداشتێکی بەسندە بەئێمە ببەخشە. بەختەوەر بیندوومان کەرەوە و هاوشێوەی شەهید بمانمرێنە نەك هاوشێوەی بەدبەختە چارەڕەشەکان.

دەڵێت: ڕۆژێك باوکی سەماك ڕۆشتە لای ڕەشید. لەم کاتەدا ڕەشید داوای ئاوی کرد و کاتێك مەبەستی خواردنەوەی کرد، باوکی سەماك وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کەمێك چاوەڕوان بە، سوێندت دەدەم بەنزیکیت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر ڕێگەی ئەم ئاوەت لێبگرن (و تۆ تینوو بیت) ئایا دەیکڕییت؟ ڕەشید وتی: بەبەهای نیوەی فەرمانڕەواییم. کوڕی سەماك وتی: بیخۆرەوە. کاتێك ڕەشید ئاوەکەی خواردەوە، کوڕی سەماك وتی: سوێندت دەدەم بەنزیکیت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر ڕێگر بن لەهاتنە دەرەوەی ئەم ئاوە لەجەستەت (لەکاتی گمیز کردن) بەهای چەندەی بۆ دیاری دەکەیت؟ وتی: هەموو فەرمانڕەوایی خۆم دەدەم. کوڕی سەماك وتی: حکومەتێك کە لەگەڵ قومێك ئاو و کەمێك گمیز ناتوانێت بەرابەری بکات، شیاوی جەنگ و کێشمەکێش نییە. ڕەشید لەم وتەیە کەوتە گریان.

دەڵێن: فەزڵ کوڕی عەیاز دەیوت: مەرگی کەس وەك هارون بۆ من ناسازگار نەبوو، خۆزگە خواوەند ساڵەکانی تەمەنی منی کەم دەکردەوە و بەهارونی

دەبەخشی. هاوەڵانی عەیاز ئەم قسەیان بەناپەسەند دەزانی. کاتێك عەیاز مرد و ئاژاوەکان سەریان هەڵدا و مەئمون خەڵکانی ناچار کرد باوەڕ بە(خلق) ئافراندنی قورئان بێنن.[8] هاوڕێیانی عەیاز وتیان: شێخ لەوتەکانی خۆی ئاگادار بوو.

محەممەد کوڕی مەنسوری بەغدادی دەڵێت: کاتێك ڕەشید باوکی ئەلعەتاهییەی خستە زیندان، سیخوڕێکی بۆ دانا تا ڕەشید لەوتەکانی ئەو ئاگادار بکاتەوە. ئەم سیخوڕە ڕۆژێك باوکی ئەلعەتاهییەی بینی کە لەسەر دیواری زیندان دەنوسێت:

اما والله ان الظلم لؤم　　　　و ما زال المسی هو الظلوم

الی دیان یوم الدین نمضی　　　　و عندالله تجتمع الخصوم

واتاکەی: سوێند بەخوا ستەم پەستییە و خراپەکار، ستەمکارە. ئێمە هەمووان بەرەو ڕۆژی هەستانەوە دەڕۆین و هەموو رکەبەرەکان لای خواوەند کۆدەبنەوە.؟

ڕەشید لەم هۆنراوە ئاگادار بوویەوە. دەستی بەگریان کرد و باوکی ئەلعەتاهییەی بۆ بارەگای خۆی بانگ کرد. داوای لێکرد بیبەخشێت و هەزار دیناری پێ بەخشی.

ئەسمەعی دەڵێت: ڕۆژێك ڕەشید خواردنێکی زۆری کۆکردەوە و سفرەیەکی ڕازاندەوە و باوکی ئەلعەتاهییەی بانگێشت کرد و پێی وت: هۆنراوەیەك سەبارەت بەنعیمەتەکانی ئەم دنیایە بهۆنەرەوە.

---

[8] یەکێك لەو بابەتانەی سەبارەت بەقورئان هاتۆتە ئاراوە و بۆتە هۆکاری ناسازگاری فراوان، وشەی ئافراندن مێژووی قورئانە بەوتایەکی دی ئافراندن یا کۆن بوونی وتاری خواوەندە. موعتەزیلە سەرسەختانە باوەڕیان بەتاقانەیی ڕەهایی خواوەند هەبوو و لەبەر ئەمە ڕازی نەدەبوون خواوەند ببێتە هەڵگری نازناوی زیادە لەزاتی ئەو چوونکە دەبێتە هۆی ئەوەی تایبەتمەندییەکانی خواوەند وەك زانست، دەسەلات و ژیان، وەك زاتی ئەو ئەزەلی و هەمیشەیی بن چوونکە ناتوانین گومانی ئەوە بکەین زاتی خوا کاتی بێ تایبەتمەندی زانست یا دەسەلات یا ژیانی بوون بێت و ئەنجامەکەی دەبێتە ئەوەیە کە جگە لەزاتی کۆنی خواوەند، زانست و دەسەلات و ژیانیش دەبێت کۆن بن و ئەمە دەبێتە هۆی (فراوان بوونی کۆنەکان) شرك. موعتەزیلە بۆ ئەوەی خواوەند بەهەڵگری ئەم تایبەتمەندییانە بزانن و لەباوەڕ بەفراوان بوونی کۆنەکان و گرفتار بوون بەشرك خۆیان بەدوور بگرن باوەڕیان بەوە پەیا کرد کەتایبەتمەندییەکانی خواوەند هاوشێوەی زاتی ئەوە نەك زیادە لەزاتی ئەو. یانی زاتی خوا وەك زانستی ئەو و وەك دەسەلاتی ئەو و وەك ئیرادەی ئەوە. ئەهلی سونەت و حەدیس و بەشوێنکەوتوویی لەوان ئەشاعیرە بڕوایان وابوو چوونکە خواوەند ئەم ناو و تایبەتمەندییانەی بۆ خۆی داناوە، بەناچاری دەبێت باوەڕ بەوە بکەین ئەم تایبەتمەندییانە لەخوادا بوونیان هەیە چوونکە ناتوانین خواوەند بۆ یەك ساتیش بێ تایبەتمەندییەکانی جیهانی وەحی و شتەکانی دیکە بزانین و بەناچاری دەبێت بڵێین ئەم تایبەتمەندییانە وەك زاتی ئەو کۆن و هەمیشەیی و ئەبەدییە و چوونکە خۆی، خۆی بەمشێوەیە ناو بردووە، کەس بەهۆی ئەم باوەڕە گرفتاری شرك و ناباوەڕی نابێت

باوکی ئەلعەتاهییەی وتی:

عش ما بدالك سالما　　　　فی ظل شاهقة الفصور

واتاکەی: لەگەڵ ئەو شتەی بۆ تۆ زیانی نییە، لەکۆشکە بەرزەکاندا بژی.

ڕەشید وتی: دەستخۆش، چیتر؟ باوکی ئەلعەتاهییە وتی:

یسعی علیك بما اشتهیـ　　　　ـت لدی الرواح و فی البکور

واتاکەی: هەوڵ دەدەن لەبەیانی و ئێواریێ، ئەوەی دەخوازی، بۆتی بێنن.

ڕەشید وتی: دەستخۆش، چیتر؟ باوکی ئەلعەتاهییە وتی:

فاذا النفوس تقعقعت　　　　فی ظل جشرجة الصدور

فهناك نعلم موقنا　　　　ما کنت الا فی غرور

واتاکەی: کاتێك گیانەکان لەجەستە دەردەچێت و هەناسەکان لەقووڵایی سینەی بەستراو، دەشکێن، لەو کاتەدا دەزانی ژیانت تەنیا بەفریودانی خۆت بەسەر بردووە.

ڕەشید دەستی بەگریان کرد. فەزڵ کوڕی یەحیا وتی: سەروەری باوەڕداران کەسی بەدوای تۆدا نارد تا شادمانی بکەیت بەڵام تۆ خەمەکانی ئەوت زیاد کرد. ڕەشید وتی: وازی لێ بێنە، ئێمەی بەکوێر بینی بەڵام نەیویست کوێری ئێمە فراوانتر بکات.

## خەلافەتی ئەمین

لەم ساڵەدا بەرەبەیانی ئەو شەوەی بەخاك سپێردرا، لەئوردووی ئەو بەیعەتی خەلافەتیان بۆ ئەمین وەرگرت. مەئمون لەو کاتەدا لەمەرو بوو. حەمویە موالی مەهدی، خاوەنی پۆست، پیەکی بەدوای یاریدەدەرەکەی خۆی سەلام باوکی موسلیم ڕەوانە کرد و لەمەرگی ڕەشید ئاگاداری کردەوە. باوکی موسلیم ڕۆشتە لای ئەمین و پرسە و خەمی خۆی دەربڕی و پیرۆزبایی خەلافەتی لێکرد. یەکەم کەس بوو ئەو کارەی کرد.

ساڵح کوڕی ڕەشید نامەیەکی بۆ ئەمینی برای نووسی و لەمەرگی ڕەشید ئاگاداری کردەوە. ڕەجای خزمەتگوزار ئەم هەواڵەی بەئەمین گەیاند. ساڵح

دەستار، جل و بەرگ و ئەنگوستیلەی خەلافەتی بۆ ئەمین نارد. کاتێك رەجا گەیشت، ئەمین لەکۆشکی خولد رووی کردە کۆشکی خەلافەت و نوێژی هەینی لەگەڵ خەڵکان خوێند. دواتر رۆشتە سەر مینبەر و خەڵکانی لەمەرگی رەشید ئاگادار کردەوە و مژدەی چاکەی پێدان و ئەمانی بەرەش و سپی بەخشی و لەناو سوپای بەغداد رۆژانەی بیست و چوار مانگەی بەخشییەوە و بەیعەتی لێ وەرگرتن. زۆرینەی بنەماڵەکەی بەیعەتیان کرد. فەرمانی بەمامی باوکی، سلێمان کوری مەنسوردا لەفەرماندەکان و کەسە گەورەکان بەیعەتی بۆ وەربگرێت. هەروەها فەرمانی بەسندی دا بەیعەت لەکەسانی دیکە وەربگرێت.

## دەستپێکی کێشەکانی نێوان ئەمین و مەئمون

ئەم ساڵە سەرەتای دەرکەوتنی کێشەکانی نێوان ئەمین و مەئمون، دوو کورەکەی رەشید بوو.

هۆکاری ئەم کێشانە ئەوە بوو کاتێك رەشید رووی کردە خوراسان و لەهەموو فەرماندەکان و سەربازەکانی ناو ئوردووگا بەیعەتی بۆ مەئمون وەرگرت و هەموو سامانەکانی ئەو ناوچەی بەمەئمون بەخشی ( ئاماژەمان پێدا) ئەمین ئەم کارەی پەسەند نەکرد. هەواڵی نەخۆشی هاورن بەئەمین گەیشت و بەکر کوری موعتەمەری بەچەندین نامەوە رەوانە کرد. ئەو ئەم نامانەی لەناو سنووقیەکان چێشتخانە کەکون کون بوو شاردەوە و کونەکانی بەپێستی مانگا داپۆشی. بەموعتەمەری وت: ئەم نامانە نە لای سەروەری باوەرداران و نەلای کەسی دیکە ئاشکرا مەکە تەنانەت ئەگەر خوێنت برێژن. کاتێك هارون مرد، نامەکان تەسلیمی خاوەنەکانیان بکە.

کاتێك بەکر کوری موعتەمەر گەیشتە توس، رەشید لەهاتنی ئاگادار بوویەوە. ئەوی بانگ کرد و لەهۆکاری هاتنەکەی پرسی. موعتەمەر لەوەڵامدا وتی: ئەمین رەوانەی کردووم لەحاڵی ئێوە ئاگاداری بکەمەوە. رەشید پرسی: ئایا نامەت پێیە؟ موعتەمەر بەنا وەڵامی دایەوە. رەشید فەرمانی پشکنینی ئەویدا بەڵام هیچیان دەست نەکەوت. فەرمانیدا قامچی بارانی بکەن بەڵام هیچی نەدرکاند. رەشید

زیندانی کرد و فەرمانی بەفەزڵ کوڕی رەبیعدا نهێنییەکەی ئاشکرا بکات و یا سەری لەجەستە جیا بکاتەوە. فەزڵ هەوڵیدا نهێنییەکەی بزانێت بەڵام موعتەمەر هیچی نەدرکاند. لەم کاتەدا ڕەشید لەهۆش چوو و هاوار و ناڵەی ژنان بەرز بوویەوە. فەزڵلەکوشتنی ئەو دەستی هەڵگرت و بەرەو لای ڕەشید بەرێکەوت. ڕەشید هاتە هۆش بێ ئەوەی موعتەمەری بیر بکەوێتەوە و دواتر مرد.

موعتەمەر لەزیندانەوە نامەیەکی بۆ فەزڵ نووسی و داوای لێکرد لەکوشتنی ئەو پەلە نەکات چوونکە فەرمانێکی پێیە و دەبێت فەزڵ فەرمانەکان جێبەجێ بکات. فەزڵ ئەوی بانگ کرد و لەمەرگی ڕەشید ئاگاداری کردەوە و پرسیاری مەبەستی هاتنی ئەوی کرد. موعتەمەر ترسا لەوەی نەوەك ڕەشید زیندوو بێت بەڵام کاتێك لەمردنی ئەو دڵنیا بوو، نامەکانی دەرهێنا. یەکەم نامە بۆ مەئمون بوو کەئەمین داوای لێدەکرد دەست لەگریان هەڵبگرێت و بۆ خۆی و ئەمین و مۆتەمەنی برایان بەیعەت لەخەڵکان وەربگرێت. مەئمون لەو کاتەدا لەمەرو بوو. ئەمین نامەیەکی بۆ ساڵحی برای نوسیبوو و فەرمانی پێدابوو سوپاکە ڕەوانە بکات بەو رێگەی فەزڵ فەرمانی پێدەدات. نامەیەکی بۆ فەزڵ نووسیبوو و فەرمانی ڕێز گرتن و پاراستنی ژن و منداڵ و سامانەکانی ڕەشیدی پێدابوو. ئەمین لەنامەکانی هەرکەسی بۆ کارێك دیاریکردبوو، کاری وەك فەرماندەی پاسەوانەکان و پارێزەران و پەردەداران.

کاتێك هەمووان نامەکەنیان خوێندەوە، لەپەیوەست بوون بەئەمین راوێژیان لەگەڵ فەرماندەکان کرد. فەزڵ کوڕی رەبیع وتی: من لەخەلیفەی ئێستا لەبەر خەلیفەیەك کەنازانم دەرئەنجامەکانی بەچی کۆتایی دێت، جیا نابمەوە. ئەو فەرمانی گەڕانەوەی بەخەڵکاندا و خەڵکان کەئارەزوومەندی گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆیان بوون، گەڕانەوە و بەیعەتەکەیان لەگەڵ مەئمون پشتگوێ خست.

کاتێك مەئمون ئاگادار بوویەوە، فەرماندەکانی باوکی کۆکردەوە کەلای ئەو بوون. ئەوان بریتی بوون لە: عەبدوالله کوڕی مالك، یەحیا کوڕی موعاز، شەبیب کوڕی حومەید کوڕی قەحتەبە، عەلا موالی هارون و پەردەداری ئەو، عەباس کوڕی موسەییب کوڕی زوهەیر فەرماندەی پاسەوانەکان، ئەییووب کوڕی باوکی سەمیری

دەبیر، عەبدولرەحمان کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی سالح،زوریاستین (فەزڵ کوڕی سەهل) دیارترینی ئەوان و زیاتر لەهەمووان لەمەئمونەوە نزیك بوو. زوریاستین هەموویانی کۆکردەوە و راوێژی لەگەڵ کردن: ئەوان پێشنیاریان کرد مەئمون لەگەڵ دوو هەزار شاسوار شوێنیان کەوێت وبیانگەرێنێتەوە بەڵام زوریاستین بەشێوەیەکی نهێنی پێی وت: ئەگەر بەپێشنیارەکەی ئەوان رازی ببیت، تۆ پێشکەشی براکەت دەکەن. بۆچوونی راست ئەوەیە نامەیەك بنووسیت و کەسێك ڕەوانە بکەیت و بەیعەتەکەیان بیر بخەیتەوە و داوایان لێ بکەیت رێز لەپەیمانەکەی خۆیان بگرن و لەپەیمان شکێنی و دواهاتەکانی بیانترسێنیت.

مەئمون ئەو کارەی کرد و سەهل کوڕی ساعد و نەوفلی خزمەتکاری بەنامەیەك ڕەوانە کرد. ئەو دووانە بەسوپاییەکان گەیشتنەوە. فەزڵ لەنەیشابوور بوو. ئەو دووانە نامەکەیان تەسلیمی فەزڵ کوڕی ڕەبیع کرد. وتی: من تەنیا یەکێك لەسوپاییەکانم. عەبدولرەحمان کوڕی جەبەلەی ئەنباری بەڕم هێرشی کردە سەر سەهل تا برینداری بکات. ڕمەکەی لەکەلەکەیدا و پێی وت: بەگەورەت بڵێ: ئەگەر لێرە دەبوویت، ئەم ڕمەم لەدەمت دەچەقاند. جوێنی بەمەئموندا.

ئەو دووانە مەئمونیان لەم کردەوەیە ئاگادار کردەوە. زوریاستین وتی: ئەوانە دوژمنانێکن لەوان ئاسوودەیت، بەڵام لەمنی ببیستە ئەم فەرمانڕەواییە هەرگیز هاوشێوەی دەورانی مەنسور شکۆ و هێزی نییە، لەو کاتەدا موقەنەع ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. (دەستەیەك دەڵێن بۆتۆڵە سەندنەوەی خوێنی ئەبو موسلیم ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە) و بەشۆڕشی ئەو سوپای خوراسان پشتی شکا. دوای ئەو یوسف بەرم دەرکەوت لەگەڵ ئەوەی موسوڵمانان ئەویان بەکافر دەزانی، سوپای خوراسان لەبەرابەر ئەویش شکستی خوارد، هەنووکە ئەی پاشا تۆ پێم بڵێ سوپای بەغداد لەکاتی ئاگادار بوون لەشۆڕشی رافیع چییان کرد؟ مەئمون وەڵامی دایەوە: ترسان. زوریاستین وتی: کەواتە ئەی تۆ چی کە لەناو خاڵۆکانت ژیان بەسەر دەبەیت (دایکی مەئمون موراجل کچی ئوستازیس سەرداری ئێرانی بوو کەدژی عەباسییەکان شۆڕشی کرد و کوژرا) و پەیمانەکەی خۆت دەخەیتە سەر شانی ئەوان؟ بێ گومان خەڵکانی بەغداد پەرێشان دەبن. خۆڕاگر بە چوونکە دڵنیام دەسەڵات دەگریتە دەست.

مەئمون وتی: ئەو کارە دەکەم و کارەکان بەتۆ دەسپێرم. هەستە و کاروبارەکان بەرێوە ببە. زوریاستین وتی: سوێند بەخوا وەفادار دەبم. عەبدوالله کوڕی مالك و فەرماندەکانی هاورێی ئەو بەرێبەرایەتی بەناوبانگی خۆی و هێزیان بۆ جەنگ لەبەرژەوەندی تۆدا دەبێت و هەرکەس سەرقاڵی ئەم کارە بێت، خزمەتی دەکەم تا تۆ بەمەبەستەکەی خۆت دەگەیت.

زوریاستین هەستا و ڕۆشتە لای ئەو دەستەیە و پەیمانەکەی بیر خستنەوە. فەزڵ دەڵێت: بەم وتەیە تۆ گومان دەکەیت بۆ هەریەك لەوان مردارێکم وەك دیاری بردووە (کە لەبۆگەنەکەی بێزار بوون) دەستەیەك وتیان: ئەم کارە ڕەوا نییە، بڕۆدەر. دەستەیەکی دیکە وتیان: کێ دەتوانێت لەنێوان سەروەری باوەڕداران وبراکەی نێوەنجیگەری بکات؟ من هاتم و مەئمونم ئاگادار کردەوە. وتی: هەستە و کاروبارەکان بەرێوە ببە. وتم: تۆ قورئانت خوێندووە و حەدیست بیستووە و لەم دینەدا ڕۆچوویت، بەباشی دەزانم پەیك بۆ لای شارەزایانی دینی ئەم ناوچەیە بنێریت و ئەوان بۆ گەڕانەوە بۆ راستییەکان و زیندوو کردنەوەی سوونەت بانگێشت بکەیت. ئەو هەمووی ئەم کارانەی بەجێهێنا و بەمشێوەیە فەرماندەکان و سەرکردەکان و شازادەکان ڕێزیان لێگرت. مەئمون هیوای بەهەمووان بەخشی بەشێوەیەك کەبەپیاوێکی تەمیمی وت: تۆ دەخەمە جێگەی موسا کوڕی کەعب، بەپیاوێکی ڕێبعی وت: پێگەیەکی هاوشێوەی باوکی داوود و خالید کوڕی ئیبراهیمت پێ دەبەخشم. بەپیاوێکی یەمانی وت: تۆ دەخەمە جێگەی قەحتەبە و مالك کوڕی هەیسەم. ئەوانە هەموویان لەسەرکردەکان و گەورەکانی عەباسی بوون. ئەو وەرگرتنی یەك لەسەر چواری باجی لەسەر خەڵکانی خوراسان هەڵگرت و خەڵکان ئەم کارەیان پەسەند کرد و وتیان: خوشکەزا و ئامۆزای پێغەمبەری ئێمەیە. ئەمین ئەو کاتەی خەڵکانی بەغداد ئارامیان گرت، ڕۆژێك دوای وەرگرتنی بەیعەت فەرمانیدا لەنزیك کۆشکی مەنسور یاریگایەك بۆ یاری چۆگان دروست بکەن. شاعیر ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

بنى امين الله ميدانا        و صير الساحة بستانا

و كانت الغزلان فيه بانا        يهدى اليه فيه غزلانا

واتاکەی: ئەمینی خواوەند یاریگایەکی دروست کرد و دەورووبەری کۆشکی کردە باخ، ئاسکەکان لەوێ روخساری خۆیان نیشان دەدەن و ئاسکەکانی وە دیاری بۆ

دێن.

مەئمونیش فەرمانڕەوایەتی سنوورەکانی خوراسانی دەکرد، دیاری بۆ ئەمین دەناردو نامەی بۆ دەنووسی و ڕێزی لێدەگرت.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا هەرسیمە کوڕی ئەعیەن گەمارۆی سەر سەمەرقەندی شکاند و ڕافیع کوڕی لەیس داوای هاوکاری لەتورکەکان کرد. ئەوان هێرشیان کردە سەر هەرسیمە و ئەو لەنێوان تورکەکان و ڕافیع گرفتار بوو. بەڵام تورکەکان گەڕانەوە و هێزی ڕافیع کەمی کرد.

لەم ساڵەدا زوبەیدە، هاوسەری هارون ڕەشید لەڕەققەوە هاتە بەغداد و ئەمینی کوڕی و دەستەیەك لەسەرکردەکانی بەغداد و براکەی پێشوازییان لێکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا نەقفوزی پاشای ڕۆم لەجەنگی بروجان دوای حەوت ساڵ پاشایەتی کوژرا و دوای ئەو کوڕەکەی ئەستەبراق بریندار، جێگەی باوکی گرتەوە بەڵام دوو مانگ دووای بریندار بوونی مرد و دوای ئەو میخائیل کوڕی جورجیس کەخوشکەکەی کردبووە هاوسەری ئەو، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت.

لەم ساڵەدا ئەمین، قاسمی برای لەفەرمانڕەوایی جەزیرە دوور خستەوە وئەوی کردە فەرمانڕەوای قێنسرین و پایتەختەکان و خوزیمە کوڕی خازمی لەجێگەی براکەی دانا.

داود کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکانە ئەنجامدا. ئەو فەرمانداری مەککە بوو.

لەم ساڵەدا سەقلاب کوڕی زیادی ئاندۆلۆسی لەهاوەڵانی مالك (پێشەوایی مەزهەبی مالکی) مرد.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی معاویەی فەزاری مرد. دەستەیەك دەڵێن ئەو لەساڵی ١٩٤/ سێپتامبەری ٨١٠ زایینی مرد.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی عولییە و ئەبوبەکری عەیاش مردن. ساڵەکانی ژیانی ئەبوبەکر نەوەد و شەش بەهار درێژ بوویەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و چواری کۆچی ( ۸۰۹ زایینی )

## ناسازگاری خەڵکانی حیمس لەگەڵ ئەمین

لەم ساڵەدا خەڵکانی حیمس ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەمینیان گرتەبەر و دژی کارکوزارەکەی ئیسحاق کوڕی سلێمان شۆڕشیان کرد. ئیسحاق ڕوویکردە سەلیمە. ئەمین ئەوی لەسەر کار لابرد و عەبدوالله کوڕی سەعیدی حەرەشی لەجێگەی ئەو دانا. ئەو خوێنی دەستەیەك لەگەورەکانی حیمسی ڕشت و دەستەیەکی خستە زیندانەوە و لەدەوروبەری شارەکە ئاگری هەڵگیرساند. خەڵکانی شار داوای ئەمانیان کرد و عەبدوالله ئەمانی پێ بەخشین بەڵام دوا بەدوای ئەوە هێرشیان کرد و لەئەنجامدا ژمارەیەکی دیکەیان لێ کوژرا.

## ڕوودانی ناسازگارییەکان لەنێوان ئەمین و مەئمون

لەم ساڵەدا ئەمین فەرمانیدا تا لەسەر مینبەرەکان بۆ موسای کوڕی بپارێنەوە (مەئمونی لەجێگری خەلیفە لابرد و موسای کوڕی لەجێگەی ئەو دانا)

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك فەزڵ کوڕی ڕەبیع لەتوسەوە هاتە عێراق و پەیمانەکەی لەگەڵ مەئمون شکاند، ئەندێشەی لەبارودۆخی خۆی کرد و زانی ئەگەر لەرۆژگاری ژیانی ئەو مەئمون خەلافەت بگرێتە دەست، دەیکوژێت. لەبەر ئەمە بەردەوام ئەمینی دژی مەئمون هاندەدا و پێداگری دەکرد تا مەئمون لەسەر کار لاببات و بۆ کوڕەکەی موسا بەیعەت وەربگرێت. ئەمین خۆی بەم کارە ڕازی نەبوو بەڵام فەزڵ بەردەوام کارەکانی مەئمونی لەبەر چاوی ئەو سوك دەکرد، بۆختانی بۆ هەڵدەبەست و دەیوت: لەدوو براکەت عەبدوالله و قاسم چ چاوەڕوانییەکت هەیە؟ بەیعەتی تۆ پێش ئەوان بووە و ئەم دووانە دوای تۆ بوونەتە جێگری خەلیفە.

عیسا کوڕی ماهان و سندی و کەسانی دیکە هاوڕای بۆچوونەکەی فەزڵ بوون

و سەرئەنجام ئەمین بەوتەکانیان رازی بوو.

ئەمین، عەبدوڵڵە کوڕی خازمی بانگ کرد و سەبارەت بەلابردنی مەئمون تا نیوەی شەو گفتوگۆی لەگەڵ کرد. عەبدوڵڵە پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، با یەکەم خەلیفە نەبیت کەپەیمان دەشکێنێت و قسەی خۆی دەخاتە ژێر پێ و گرنگی بەوتەکانی خەلیفەی پێشوو نادات. ئەمین وتی: بێدەنگ بە. ئەندێشەی عەبدولمەلیك لەتۆ باشتر و روانینی لەتۆ گشتگیرترە. دوو شێر لەدارستانێك جێگەیان نابێتەوە.

ئەمین فەرماندەکانی کۆکردەوە و بۆچوونی خۆی سەبارت بەلابردنی مەئمون بۆ باس کردن. ئەوان لەرازی بوون بەم کارە خۆیان بەدوور گرت جگە لەدەستەیەکی کەمیان تا ئەوەی خوزەیمە کوڕی خازم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەرکەس درۆ بۆ تۆ هەڵبەستێت، چاکە نابینێت، و هەکەرس هاورێی تۆ بێت، هیچ کات ناجوامێرانە پشتت تێ ناکات. فەرماندەکان بۆ لابردنی مەئمون هان مەدە ئەگەری هەیە لەسەر کار لاتبەرن وئەوان ناچار بەپەیمان شکێنی مەکە چوونکە ئەگەری هەیە پەیمان و بەیعەتەکەی تۆ بشکێنن. فریوکار بێ هاوەڵ دەمێنێتەوە و پەیمان شکێن، دەست بەستراو.

لەم کاتەدا، ئەمین رووی کردە عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان، بزەیەکی گرت و وتی: بەڵام پیری ئەم کۆبوونەوە و وەزیری ئەم حکومەتە لەگەڵ پێشەوای خۆی رێگەی ناسازگاری ناگرێتەبەر و فەرمانەکانی پشتگوێ ناخات. دواتر بەرادەیەك پێگە و جێگەی عەلی کوڕی عیسای بەرز کردەوە پێشتر بۆ کەس ئەو کارەی نەکردبوو چوونکە ئەو و فەزڵ کوڕی رەبیع بۆ لابردنی مەئمون هێزیان پێ دەبەخشی. ئەمین بۆ لابردنی مەئمون پێداگری کرد. رۆژێك بەفەزڵ کوڕی رەبیعی وت: ئەی فەزڵ، ئایا ژیان لەگەڵ مەئمون رەوایە؟ دەبێت ئەو لاببەم. فەزڵ مژدەی پێدەدا و دەیوت: کەی ئەم کارە ئەنجام دەدەیت، ئەو کاتەی مەئمون دەستی بەسەر خوراسان و ناوچەکانی دیکەدا گرت؟ یەکەم کاری ئەمین ئەوە بوو نامەی بۆ هەموو کارگوزارەکان نووسی کەدوای مەئمون و مۆتەمەن ناوی موسای کوڕی بێنن.

کاتێك مەئمون لەم کارە ئاگادار بوویەوە و هەواڵی لابردنی مۆتەمەنی لەجەزیرە

بیست، ناوی ئەمینی پشتگوێ خست و نامەبەری ئەوی دەرکرد.

کاتێك رافیع کوڕی لەیس کوڕی نەسر کوڕی سەیار لەچاکەکاری مەئمون ئاگادار بوویەوە، داوای ئەمانی لێکرد. مەئمون ئەمانی پێبەخشی. ئەو هاتە لای مەئمون. هەرسیمە هاوڕێ لەگەڵ تاهیر کوڕی حسەین لەسەمەرقەند مانەوە بەڵام دواتر هەرسیمە هاتە لای مەئمون. مەئمون ڕێزی لێگرت و ئەوی وەك فەرماندەی پاسەوانەکان دەستنیشان کرد بەڵام ئەمین گرنگی بەم کارانە نەدەدا. ئەمین بیری کردەوە نامەیەك بۆ عەباس کوڕی عەبدوالله کوڕی مالك کارگوزاری مەئمون لەڕەی بنێرێت و فەرمانی پێ بدات تا نەمامەکان لەباشترین دارەکانی ڕەی ڕەوانە بکات. دەیویست بەم فەرمانە عەبدوالله کوڕی عەباس تاقی بکاتەوە. عەباس داواکارییەکەی بەجێهێنا و ئەم کارەی لەمەئمون و زوریاستین شاردەوە بەڵام کاتێك مەئمون ئاگادار بوویەوە، حەسەن کوڕی عەلی مەئمونی لەجێگەی ئەو دانا.

ئەمین ئەم چوار کەسەی بۆ لای مەئمون نارد: عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی، عیسا کوڕی جەعفەر کوڕی مەنسور، ساڵحی پێشنوێژ و محەممەد کوڕی عیسا کوڕی نەهیك و بەنێوەنجیگەری ئەوان پەیامی نارد کەموسا پێش خۆی بخات و خۆی بڕواتە لای چوونکە بەرگەی دووری ئەو ناگرێت. مەئمون ئاگادار بوویەوە و نامەی بۆ کارگوزارەکانی خۆی لەڕەی و نەیشابور و شوێنەکانی دیکە نووسی هێز و توانایی خۆیان نیشان بدەن. ئەو کارەیان کرد. نێردراوان هاتنە لای مەئمون و پەیامەکەی خۆیان گەیاند. کوڕی ماهان ئەمینی دڵ ئاسوودە کردبوو کەخوراسانییەکان شوێنکەوتەی ئەون.

کاتێك مەئمون ئەم پەیامەی بیست، لەگەڵ فەزڵ کوڕی سەهل راوێژی کرد. فەزڵ پێی وت: راوێژ لەگەڵ هوشام باوکی عەلی و ئەحمەد بکە. مەئمون ئەوی بانگ کرد و لەگەڵی ئاخاوت. وتی: بەیعەتی ئێمە لەگەڵ تۆ تا ئەو کاتەی خوراسان بەجێنەهێڵیت و ئەگەر ئەو کارە بکەیت، چیتر بەیعەتی تۆ لەسەر شانی ئێمە نییە. سڵاو و بەخشیینەکانی خواوەند بۆ سەروەری باوەڕداران. هەنووکە ئەگەر بخوازیت بڕۆیت، بەدەستی ڕاستم داوێنت دەگرم و ئەگەر دەستم لاببەیت، بەدەستی چەپم و ئەگەر دەستم لاببەیت، بەزمان ڕێگە لەڕۆشتنت دەگرم، ئەگەر

سەرم لەجەستە جیابکەیتەوە، کارەکەی خۆم ئەنجام دەدەم.

مەئمون بڕیاریدا لەخوراسان نەڕواتەدەر. ئەو عەباس (نێردراوی ئەمینی) بانگ کرد و ئاگاداری کردەوە کەخوراسان بەجێناهێڵێت و موسا پێش خۆی ناخات. عەباس کوڕی موسا پێی وت: ئەی پاشا، بۆ ئەم کارە لەچی دەترسیت؟ باوەگەورێی من عیسا کوڕی موسا خۆی لەسەر کار لابرد بێ ئەوەی زیانی پێ بگات. زوریاستین دەنگی بەرز کردەوە: بێدەنگ بە، باوەگەورێی تۆ ئەسیر بوو و مەئمون لەناو خاڵۆکانی خۆی و شوێنکەوتەکانی خۆیدایە.

هەمووان هەستان و ڕۆشتن و زوریاستین بەنهێنی لەگەڵ عەباس کوڕی موسا قسەی کرد و دڵنەوایی کردەوە و مژدەی سەرپەرەستی کردنی حەج و فەرمانڕەوایی چەندین ناوچەی لەمیسر پێدا. ئەو ڕازی بوو بەیعەت لەگەڵ مەئمون بکات و هەمان کات مەئمونی بە(ئیما) بانگ کرد. عەباس لەبەغدادەوە هەواڵەکانی بۆ مەئمون دەنارد.

نێردراوەکانی ئەمین گەڕانەوە و ڕازی نەبوونی مەئمونیان پێ ڕاگەیاند. فەزڵ و عەلی کوڕی عیسا پێداگرییان کرد ئەمین، مەئمون لاببات وبۆ کوڕەکەی موسا کوڕی ئەمین بەیعەت وەربگرێت. ئەمین بۆ مەئمونی نووسیبوو دەبێت دەست لەبەشێك لەئاوەدانییەکانی خوراسان بشوات و پەیکێکی ئەمین لەبارەگای ئەو بێت تا هەواڵەکان بۆ ئەمین بنێرێت. مەئمون لەگەڵ فەرماندەکان و گەورەکان ڕاوێژی کرد. وتیان: ڕازی ببە تا تۆوی ئاژاوە نەمێنێت ئەگەری هەیە گرفتاری ئاژاوەیەکی گەورەتر ببین.

حەسەن کوڕی سەهل پێی وتن: ئایا دەزانن ئەمین داوای ئەوە دەکات کەتایبەت نییە بەو؟ وتیان: بەڵێ بەڵام گومان دەکەین وەڵام نەدانەوەی ئەو بێ زیان نییە. حەسەن وتی: ئایا باوەڕتان هەیە دوای جێبەجێ کردنی ئەم داوایە، داوایەکی دیکەی نابێت؟ وتیان: نە. حەسەن وتی: ئەگەر داوایەکی دیکەی پێشنیاری کرد، چی دەکەن؟ وتیان: ڕازی نابین. وتی: ئەمە لەگەڵ قسەی فرەزانەکان ناسازگارە کە: دواهاتەکانی کارەکەت بەناخۆشییەکانی ئەمڕۆ ڕێکبخە و ئارامی ئەمڕۆ بەبەهای ئاژاوەی سبەی، مەکرە. مەئمون بەزوریاستینی وت: بۆچوونی تۆ چییە؟

زوریاستین وتی: خواوەند بەختەوەرت بکات، ئایا گومان ناکەیت ئەمین دەخوازێت هێز و سوپاکەت لێ بستێنێت و لەدژی تۆ بەکاریان بیات؟ فرەزانەکان دەڵێن: قورسایی ئەمڕۆ بخە سەرشان تا دوواهاتێکی خۆشت هەبێت.

مەئمون وتی:هەڵبژاردنی ئارامشێکی کاتی دەبێتە هۆی فیرۆیی دوواهات لەهەر دوو دنیا. بەمشێوەیە بەداواکەی ئەمین رازی نەبوو. ئەو کەسە بڕواپێکراوەکانی خۆی بۆ سنوورەکان نارد تا کەس نەتوانێت مەگەر لەسەر بڕیاری ئەم کەسانە لەسنوورەکان بوگزەرێت. هەروەها خەڵکانی خوراسانی ئاگادار کردەوە لەوەی بەهۆی تەماح یا ترسەوە رێگەی دژایەتی بگرنەبەر. مەئمون رێگەکانی بەکەسە بڕواپێکراوەکانی خۆی خستە ژێر چاودێرییەوە. کەس نەیدەتوانی بڕواتە ناو خوراسان مەگەر ئەوەی دەیاننناسی یا مۆڵەتی هاتنە ناوی پێبوایە یا ئەوەی کەسەکە بازرگانێکی ناسراو بوایە. هەموو نامەکان دەخوێنرانەوە.

دەڵێن: کاتێك ئەمین مەبەستی ئەوەی کرد نامە بۆ مەئمون بنووسێت و فەرمانی چاوپۆشی لەچەندین ناوچەی پێ بدات، ئیسماعیل کوڕی سەبیح پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەم کارە دەبێتە هۆی گومانی خراپ و وشیاری شوێنکەوتەکانی مەمئون زیاد دەکات بەڵام نامەیەکی بۆ بنووسە و نیازەکانی خۆتی لەگەڵدا باس بکە و ئاگاداری بکەرەوە لەم حکومەتە خواییەدا دەخوازیت لەو نزیك بیت و لەهاوکاری ئەو کەڵك وەربگریت، داوای لێ بکە بێتە لای تۆ تا بەهاوکاری یەك فەرمانڕەوایی بەرێوە ببەیت. ئەویش نامەیەکی بۆ مەئمون نووسی و ئەوی لەگەڵ دەستەیەك بۆ لای مەئمون نارد. فەرمانی پێدان هەموو توانای خۆیان بخەنەگەر تا بتوانن مەئمون بێننە بارەگای ئەو. کاتێك نێردراوەکان گەیشتنە لای مەئمون و مەئمون نامەی ئەمینی خوێندەوە، دەستەیەك وتیان لەبەرژەوەندی گشتیدایە بەمەبەستەکەی رازی ببێت. زوریاستین پێی وت خوراسان بەجێ نەهێڵێت و لەنزیك بوونەوە لەئەمین خۆی بەدوور بگرێت. مەئمون وتی: شیاو نییە دژایەتی ئەو بکەم لەکاتێکدا زۆرینەی فەرماندەکان لەگەڵ ئەودان و سامانی فراوان و خەڵکان زیاتر خوازیاری درهەم و دینارن لەوەی رێز لەپەیمان بگرن، هەنووکە ناتوانم بەداواکەی رازی نەبم، خەڵکانی جەیغویە ئاڵای شۆڕشیان

بەرز کردۆتەوە و فەرمانڕەوای تبت ڕێگەی نافەرمانی گرتۆتەبەر و پاشای کابول مەبەستی هێرش کردنە سەر سنوورەکانی کردووە و پاشای ئەترابەندە چیتر باج نادات، هیچ ڕێگە چارەیەکەم بۆ ئەمانە نییە، دەبێت ئەوەی هەمە پشتگوێی بخەم و پەنا بۆ پاشای تورك ببەم بۆ ئەوەی گیانی خۆم دەرباز بکەم.

زوریاستین وتی: دواهاتی فریو، ناخۆشە و دواهاتی دەستدرێژی نائەمن، ئەگەری هەیە دۆڕاوێك سەر لەنوێ سەرکەوتن بەدەست بێنێتەوە، سەرکەوتن بەزۆری و کەمی نییە و مەرگ ئاسانترە لەرازی بوون بەریسوایی. ڕۆشتن بۆ لای براکەت بێ هێز و توانایی هاوشێوەی سەرێکی بێ جەستەیە. تۆ لای ئەو هاوشێوەی یەکێك لەخەڵکان دەبیت. فەرمانی ئەو دەبێت جێبەجێ بکەیت بێ ئەوەی لەشەڕ لەگەڵ ئەو شکستت خواردبێت و ناچار بیت. نامەیەك بۆ جیغویە و خاقان بنووسە و هەردووکیان وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینەکەیان دیاری بکە، دیاری و پێشکەشییەکان بۆ پاشای کابول ڕەوانە بکە و ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەودا بگرەبەر، گرنگی بەباجی ئەترابەندە مەدە و هەموو هێزەکانی ناوچەکانی خوراسان کۆبکەرەوە و پەیوەستی سوپاکەتیان بکە. ئەسپەکان لەبەرابەر یەك و پیادەکان لەبەرابەر یەك، ئەگەر سەرکەوتنت بەدەست هێنا، بەمەبەستی خۆت گەشتوویت وئەگەر شکستت خوارد، پەیوەستی خاقان دەبیت.

مەئمون هەستی بەراستی و دروستی قسەکانی کرد و بەکاری بەست. پاشا یاخییەکان شادمان بوون و پەیوەستی سوپاکەی مەئمون بوون و لەدەوری کۆبوونەوە. مەئمون نامەیەکی بۆ ئەمین نووسی: دوای سپاسی خواوەند، نامەی سەروەری باوەڕداران خوێندەوە. خۆم بەیەکێك لەکارگوزارەکانی سەروەری باوەڕداران دەزانم و هاوڕێیەك لەهاوڕێیانی ئەو. ڕەشید فەرمانی پێداوم پارێزگاری لەم سنوورە بکەم. سوێند بەگیانی خۆم بوونی من لێرە بۆ سەروەری باوەڕداران پێویستترە و لەبەرژەوەندی موسوڵماناندایە، هەرچەند ئەگەری لای سەروەری باوەڕداران بم بەبینینی ئەو شادمان دەبم بەلاّم ئەگەر سەروەری باوەڕداران مۆڵەت بدات لێرە دەمێنمەوە.

کاتێك ئەمین نامەکەی مەئمونی خوێندەوە زانی بەداواکەی رازی نابێت.

نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێکرد لەبەشێك لەناوچەکانی خوراسان چاوبپۆشێت – پێشتر باسمان کرد– کاتێك مەئمون بەم داوایەیش رازی نەبوو، دەستەیەکی بۆ لای ئەو نارد تا لەمبارەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، بەڵام کاتێك ئەم دەستە گەیشتنە رەی، رێگەی ڕۆشتنە پێشیان پێ نەدرا. پاسەوانەکان مۆڵەتیان پێ نەدان ئەم دەستەیە هەواڵی ئەم کارە بەکەس بگەیێن و هەواڵیان لەکەسێکەوە بۆ بێت. بڕیاریاندا فەرمانەکانی ئەمین لەناو خەڵکاندا بخوێننەوە و هەموان لەیاخی بوونی مەئمون ئاگادار بکەنەوە بەڵام توانایی ئەو کارەیان پێ نەبڕا. کاتێك گەڕانەوە، ئەمینیان لەهەموو شتێك ئاگادار کردەوە.

دەڵێن: کاتێك ئەمین مەبەستی لابردنی مەئمونی کرد و فەزل و کوڕی ماهان بۆ ئەم کارە هانیاندەدا، یەحیا کوڕی سولەیمی بانگ کرد و لەگەڵی ئاخاوت. وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، چۆن ئەو کارە دەکەیت لەکاتێکدا ڕەشید بەیعەتی بۆ وەرگرتووە و لەوەسیەت نامەکەی خۆی سوێند و پەیمانی وەرگرتووە؟ ئەمین وتی: بۆچوونی ڕەشید بۆچوونێکی هەڵە بوو و جەعفەر کوڕی یەحیا ئەم کارەی ئەنجامدا، تەنیا لابردنی ئەو لەبەرژەوەندی ئێمەدایە.

یەحیا وتی: ئەگەر سەروەری باوەڕداران خوازیاری لابردنی ئەوە، لەئاشکرا کردنی ئەم مەبەستە خۆی بەدوور بگرێت چوونکە ئەم کارە لای خەڵکان ناپەسەندە، دەستە دەستە سوپاییەکان بانگ بکە و فەرماندەکان یەك یەك بێنەرە لای خۆت، نەرمییان لەگەڵ بنوێنە و دیارییان پێ ببەخشە، کەسە بڕواپێکراوەکانی مەئمون لەدەوری ئەوە بڵاوە پێبکە و تەماحی پارەیان بخەرە بەردەم، ئەوسا کەهێزی ئەوت تێکشکاند و پیاوەکانت لەهاوکاری کردنی ئەو دوور خستەوە، فەرمانی پێبدە بێتە بێتە دەرگای تۆ، ئەگەر هات بەخواستی خۆت دەگەیت و ئەگەر رازی نەبوو، دەتوانی بەسەریدا زاڵ ببیت. ئەمین پێی وت: تۆ هەڵیت و پڵیت دێنیتە سەرزمان و بۆچوونی راستت نییە، هەستە و شوێن کارەکانی خۆت کەوە.

فەزڵ کوڕی سەهل دەستەیەك لەبڕوا پێکراوانی لەبەغداد دانابوو تا لەهەواڵەکان ئاگاداری بکەنەوە. فەزڵ کوڕی رەبیع پارێزگاری لەرێگەکان دەکرد. هەرکات یەکێك لەم دوو دەستە نامەیەك لەهەواڵێکی تازەیان بۆ زورياستێن

دەنووسی، بەژنێکدا دەیاننارد. ئەو ژنە وای نیشان دەدا وەك بڵێی دەیەوێت لەگوندێکەوە بڕواتە گوندێکی دیکە. کاتێك فەزڵ کوڕی ڕەبیع بۆ لابردنی مەئمون پێداگری کرد، ئەمین بەداواکەی ڕازی بوو و لەسەفەر/نۆڤەمبەریا ڕەبیع الاول/ دێسامبەری ساڵی ١٩٥/٨١٠ زایینی (بەخواستی خوا دواتر ئاماژەی پێدەدەین) بەیعەتی بۆ کوڕەکەی وەرگرت و نازناوی (الناطق بالحق) (ڕاستگۆی) پێبەخشی و چیتر ڕێگەی نەدا لەسەر مینبەرەکان ناوی مەئمون و مۆتەمەن بێننە سەرزمان. دەستەیەك لەپەردەدارانی بۆ کەعبە ڕەوانە کرد تا ئەو دوو پەیمان نامەی ڕەشید بۆ مەئمون و مۆتەمەن بەدیواری کەعبەوە هەڵواسیبوو، لێبکەنەوە و بیهێننە لای ئەو. فەزڵ دوو پەیمان نامەکەی لەت لەت کرد.

کاتێك مەئمون لەم کارە ئاگادار بوویەوە، بەزوریاستینی وت: پێشبینییەکانمان هاتەدی. هەنووکە ئەوەمان بەسە کەراستیمان لەگەڵدایە.

یەکەم کاری زوریاستین دوای ئاگادار بوون لەلابردنی ناوی مەئمون لەکاتی نوێژ، کۆکردنەوەی سوپاییەکان بوو کە لەدەوروبەری ڕەی لەگەڵ سوپاییەکانی ئەو دیارە، نیشتەجێ کرابوون. وشکەساڵی لەم ساڵەدا یەخەی ئەو دیارەی گرت، زوریاستین بەرادەیەك خواردەمەنی و پێویستییەکانی ژیانی بۆ ناردن کە لەو بەلایە ڕزگارییان بوو. ئەوان لەسنوورەکان مانەوە و یەك هەنگاویش پاشەکشێیان نەکرد. زوریاستین، تاهیر کوڕی حسەین کوڕی موسعەب کوڕی زورەیق کوڕی ئەسعەد باوکی عەباسی خوزاعی وەك فەرماندەی ئەوان ڕەوانە کرد و چەندین سەرکردەی دیکەی کردە هاوڕێی ئەو. تاهیر ملی ڕێگەی گرتەبەر و گەیشتە ڕەی، لەوێ خێوەتی هەڵدا و پاسگە و پادگانەکانی دروست کرد. یەکێك لەشاعیرەکانی خوراسان وتی:

| | |
|---|---|
| رمى اهل العراق و من عليها | امام العدل و الملك الرشيد |
| باحزم من نشا رأيا و حزما | و كيدا نافقا مما يكيد |
| بداهية تأدى خنفقيق | يشيب لهول صولتها الوليد |

واتاکەی: سوڵتانی ڕزگاربوو و پاشای دادپەروەری، مەبەستی خەڵکانی عێراق و فەرماندەکانی کرد، کەسێك کە لەهەمووان دوورئەندێشترە و بەئەندێشە و

کاریگەرترین ڕێگەچارەکان گەشەی کردووە (یانی مەئمون) ئەو دوژمنانی وەك دێوێکی ترسێنەر نیشاندا کە لەترسا مووی منالی کەم تەمەن، هاوشێوەی پیرەکان سپی دەبێت.

ئەمین، عیسمەت کوڕی حیمادی لەگەڵ هەزار سوار بۆ هەمەدان ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا پێشەنگەکانی سوپاکەی بۆ ساوە بنێرێت و چەندین پادگانە لەهەمەدان بنیات بنێت. فەزڵ کوڕی ڕەبیع و عەلی کوڕی عیسا، ئەمینیان بۆ جەنگی مەئمون هاندەدا.

کاتێك ئەمین بۆ موسای کوڕی بەیعەتی وەرگرت، عەلی کوڕی عیسای وەك وەزیری ئەو دەستنیشان کرد و محەممەد کوڕی عیسا کوڕی نەهیکی کردە فەرماندەی پاسەوانەکان. عوسمان کوڕی عیسا کوڕی نەهیکی وەك فەرماندەی حەرەسەکان و عەلی کوڕی سالحی پێشنوێژی وەك دەبیر دیاریکرد.

## ناسازگاری خەڵکانی تونس لەگەڵ کوڕی ئەغلەب

لەم ساڵەدا عیمران کوڕی موجالیدی ڕەبیعی و قورەیش کوڕی تونسی لەتونس دژی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب فەرمانڕەوای ئەفریقییە ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە. خەڵکانێکی زۆر لەدەوری ئەم دوو کەسە کۆبوونەوە دەورواندەوری کۆشکی ئیبراهیمیان گرت و شوێنکەوتەکانی ئەویان دیل کرد. لەمانگی جومادی الاخرە/فەوریە خەڵکانی قەیرەوانیش ڕاپەڕین. لەنێوان ئەوان جەنگێکی قورس ڕوویدا و دەستەیەك لەهێزەکانی کوڕی ئەغلەب کوژران.

عیمران کوڕی موجالید لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی لەدەی ڕەجەب/١٨ ئاوریلی ٨١٠ زایینی هاتە قەیرەوان و قورەیش لەتونسەوە بەڕێکەوت. لەم مانگەدا لەنێوان ئەم دووانە شەڕێکی قورس ڕوویدا و سوپاکەی کوڕی ئەغلەب شکستیان خوارد. دوبارە لەبیستی ئەم مانگە ڕووبەڕوو بوونەوە و دووبارە کوڕی ئەغلەب شکستی خوارد. بۆ سێیەم جار دوو سوپا ڕووبەڕووی یەك بوونەوە و ئەم جارە شوێنکەوتەکانی کوڕی ئەغلەب سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. عیمران کوڕی موجالید کەسی بەدوای ئەسەد کوڕی فیراتی فەقیە نارد تا لەم شۆڕشەدا

هاوکارییان بکات بەڵام ئەو ڕازی نەبوو. نێردراو دووبارە گەڕایەوە بۆ لای و وتی: یا پەیوەستی ئێمە دەبیت یا کەسێك دەنێرم بەراکێشان تۆ بێنێتە لای ئێمە. ئەسەد وەڵامی نێردراوەکەی دایەوە: بەموجالید بڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر بێمەدەر، بەخەڵکان دەڵێم کەکوژراو و بکوژە، هەردووك لەئاگردا دەسووتێن. موجالید دەستی لێ هەڵگرت.

## شۆڕشی خەڵکانی ماردە و هێرشی حەکەم بۆ سەرزەمینی فەرەنگ

لەم ساڵەدا جارێکی دیکە خەڵکانی ماردە، لەگەڵ حەکەم کوڕی هوشام ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و دژی ئەو ڕاپەڕین. حەکەم خۆی ڕووبەڕوویان بوویەوە و جەنگی کرد. سوپاییەکانی حەکەم لەم ساڵە و ساڵی ١٩٥/٨١٠ زایینی و ١٩٦/ ٨١١ زایینی سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ خەڵکانی ماردە بوون.

فەرەنگییەکان چاوی تەماحیان بڕیبیە سەرزەمینە ئیسلامییەکان و مەبەستی هێرش کردن و گرفتاری کردنی موسوڵمانانیان کرد. حەکەم سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ خەڵکانی ماردە بوو و نەیدەتوانی بەتەنیا ڕووبەڕووی فەرەنگییەکان ببێتەوە. ئاگاداریان کردەوە بارودۆخ لەسەر کارگوزاران و سنووردارەکان دژوار بووە. بیستی فەرەنگییەکان ژنێکی موسوڵمانانیان ئەسیر کردووە و ژنەکە هاواری کردووە: هاواری، حەکەم. ئەمە لای حەکەم دژوار بوو، سوپاکەی ڕازاندەوە و هێزی کۆکردەوە و لەساڵی ١٩٦/٨١١ زایینی بەهەموو هێز و توانای خۆی ڕووبەڕووی فەرەنگییەکان بوویەوە و دەستی بەسەر چەندین قەڵاداگرت، سامانی ئەوانی تاڵان و خوێنی پیاوانی ڕشت و ژنانی ئەسیر کرد. دواتر هێرشی کردەسەر ئەو ناوچەی ئەم ژنەیان تیا ئەسیر کردبوو، لەوێ دەستەیەك لەئەسیرەکانی ئاڵوگۆڕ کرد. بۆ ئازاد کردنی ئەو ژنە ئەوەندە پێداگری کرد تا سەرئەنجام ئازادی کرد. حەکەم خوێنی ئەسیرەکانی دیکەی ڕشت و کاتێك کۆتایی بەجەنگەکە هێنا، بەسنووردارانی وت: ئایا حەکەم هاوکاری کردن؟ وتیان: بەڵێ. وەسفیان کرد و بۆی پاڕانەوە و حەکەم گەڕایەوە بۆ کوردوبا.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان دژی پاشاکەیان میخائیل شۆڕشیان کرد. ئەو هەڵات و خواپەرەستی کردە پیشە. بۆ ماوەی دوو ساڵ پاشایەتی کرد.

ئیبراهیم کوڕی عەباس فەرمانڕەوای موسڵ لەلایەن ئەمینەوە بوو.

لەم ساڵەدا شەقیقی بەڵخی لەجەنگی کولان لەشارەکانی تورك کوژرا.

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی موسلیم هاوڕێی ئەوزاعی، مرد. دەستەیەك دەڵێن ئەو لەساڵی ١٩٥/ ٨١٠ زایینی مردووە. لەساڵی ٧٣٧/١٢٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا حەفص کوڕی غیاسی نەخەعی سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، مرد. لەساڵی ٧٤٤/١٢٧ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا عەبدوەهاب کوڕی عەبدمەجیدی سەقەفی مرد. لەساڵی ٧٤٣/١٢٦ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو لەکۆتاییەکانی تەمەنی حەدیسەکانی تێکەڵ بەیەك دەکرد. پێشتر حەدیسەکانی بەحەدیسی ڕاست لەقەڵەم دەدرا.

لەم ساڵەدا سیبویەی نەحوی مرد. ناوی عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی قەنبەر و نازناوەکەی باوکی بەشیر بوو. دەڵێن: لەساڵی ١٨٣/ ٧٩٩ مردووە. زیاتر لەچل ساڵ ژیا. دەستەیەك ساڵەکانی تەمەنی بەسی و دوو دەزانن.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی سەعید کوڕی ئەبان کوڕی سەعید کوڕی عاس لەتەمەنی حەفتا و چوار ساڵی کۆچیی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و پێنجی کۆچی ( ٨١٠ زایینی )

## ناونەهێنانی مەئمون لەوتارەکان ( خوتبەکان )

لەم ساڵەدا ئەمین فەرمانیدا ناوی مەئمون لەسەر هەموو دینار و درهەمەکانی خوراسان بسڕنەوە کە لەساڵی ٨٠٩/١٩٤ زایینی لێدرابوو چوونکە ناوی ئەمینیان لەسەر ئەم سکانە هەڵنەکەندبوو. فەرمانیدا لەسەر مینبەرەکان بۆ موسا کوڕی ئەمین بپارێنەوە. وەك دەستەیەك دەڵێن ناوی مەئمونیان لەناو وتارەکانیان نەدەهێنا. لەو ڕۆژگارەدا موسا مناڵێکی کەم تەمەن بوو. هەروەها فەرمانیدا ناوی عەبدوڵڵەی کوڕی بێنن کەنازناوی (القائم بالحق) ی پێبەخشیبوو.

## جەنگی عەلی کوڕی عیسا و تاهیر

ئەمین فەرمانیدا عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان بۆ جەنگی مەئمون بەرێکەوێت.

هۆکاری ئەوەی ئەو بۆ جەنگی مەئمون هەڵبژێردرا ئەوە بوو زوریاستین لای فەزڵ کوڕی ڕەبیع سیخوڕێکی دانابوو کەفەزڵ ڕاوێژی لەگەڵ دەکرد و بۆچوونەکانی بەکار دەبەست. زوریاستین بۆ ئەم سیخوڕە نامەی نووسی و فەرمانی پێدا تاپێشنیار بکات کوڕی ماهان بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە بکەن چوونکە کوڕی ماهان لەکاتی فەرمانڕەوایی لەخوراسان لەسەردەمی ڕەشید خراپەی زۆری لەگەڵ خەڵکی ئەو دیارە کرد و ڕەشید لەبەر خراپەکاری ئەوی لەسەر کار لابرد. خەڵکانی خوراسان لەو بێزار بوون و بەدوژمنی خۆیان هەژماریان دەکرد. زوریاستین دەیویست بەم کارە خەڵکی خوراسان بۆ جەنگ دژی ئەمین هان بدات.

سیخوڕ فەرمانەکەی زوریاستینی پێشنیار کرد و ئەمین، فەرمانی هێرشی بەکوڕی ماهاندا.

دەڵێن: عەلی (کوڕی ماهان) بەئەمینی وتبوو خەڵکانی خوراسان نامەیان بۆ نووسیوە ئەگەر بڕواتە سەرزەمینەکەیان، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبن و تەنیا

بەفەرمانەکانی ئەو رازی دەبن. لەبەر ئەمە ئەمین ئەوی ڕەوانە کرد و هەموو زەمینە ئاوەدانەکانی کوێستانی لەنەهاوەند، هەمەدان، قوم، ئیسفەهان و ناوچەکانی دیکەی خستە ژێر فەرمانی ئەو و جەنگ و ئاشتی و باجی بەو سپارد. سامانێکی زۆری خستەبەر دەست و دەستی بۆ سەر گەنجینەکان ئاوەڵا کرد. پەنجا هەزار شەڕکەری بۆ ئەو کۆکردەوە و فەرمانی بەباوکی دۆڵف قاسم کوڕی ئیدریس کوڕی عیسای عیجلی و هیلال کوڕی عەبدوالله حەزرەمیدا پەیوەستی بن. بەردەوام هێزی شەڕکەر و سامانی زیاتری بۆ دەنارد.

کاتێك عەلی کوڕی ماهان لەبەغدادەوە بەرێکەوت، بۆ ماڵئاوایی ڕۆشتە بارەگای زوبەیدە. زوبەیدە پێی وت: ئەی عەلی! هەرچەند سەروەری باوەڕداران کوڕی منە و خۆشم دەوێت بەلاَم مەئمونیشم خۆش دەوێت و خۆشەویستی ئەو لەدڵمایە، ئاگادار بە زیانی بەرنەکەوێت و ئازار نەدرێت. کوڕی من پاشایەکە و بۆ فەرمانڕەوایی رکابەری براکەی دەکات (رژدی بەدەسەلاَتەکەی ئەو بردووە) بەلاَم تۆ پێگەی برایەتی ئەو لەبەر چاو بگرە و بەتوندی قسەی لەگەڵ مەکە چوونکە هاوشانی تۆ نییە، هاوشێوەی کۆیلەکان هەڵس و کەوتی لەگەڵ مەکە و بەدیل کردنی ئەو ریسوا مەکە، لەکەنیز وخزمەتکارەکانی جیای مەکەرەوە و لەرێگە ڕۆشتن، بارودۆخی لێ دژوار مەکە، شان بەشانی ئەو بەرێگەدا مەڕۆ و جڵەوی ئەسپەکەی بگرە دەست، ئەگەر جوێنی پێدایت، وەلاَمی مەدەرەوە. زنجیرێکی سیمینی پێدا و وتی: ئەگەر بەسەر ئەودا سەرکەوتیت، بەم زنجیرە بیبەستەرەوە. کوڕی ماهان وتی: فەرمانبردارم.

عەلی کوڕی عیسا لەشەعبان/ئاوریلی زاییبنی هێرشی کردە سەر مەئمون. ئەمین فەرماندەکان و سەرکردەکانی ڕەوانە کرد. پیرانی بەغداد دەیانوت تا ئێستا سوپایەکی بەو گەورەییە و بەو ژمارە زۆرەیان نەبینیوە. ئەمین پێی وت: ئەگەر مەئمون بڕیاری جەنگیدا هەوڵ بدە دیلی بکەیت (بیر لەکوشتنی ئەو نەکاتەوە)

کوڕی ماهان رووی کردە ڕەی. لەجەلەولا رووبەرووی کاروانییەکان بوویەوە و پرسیاری لێکردن. وتیان: تاهیر لەڕەی هێز کۆدەکاتەوە و هێزە هاوکارییەکان لەخوراسانەوە بەردەوام پەیوەستی دەبن. ئەو خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکات.

عەلی کوڕی عیسا دەیبیست و دەیوت: تاهیر دڕکێك لەدارەکەی منە و کەسێکی وەك تاهیر ناتوانێت فەرماندەیی سوپایەك بکات. روویکردە هاوڕێکانی و وتی: ئەوەندەی نەماوە با، ئەم دارە بکاتە دوو کەرت، بایەك کە لەتۆفان دەچێت چ بکات بەوەی هەواڵی گوزەر کردنی ئێمە لەهەمەدان ببیستێت. بەرخۆلە چۆن دەتوانێت بۆ شەرە شاخ خۆڕاگر بێت یا ئێستر چۆن دەتوانێت لەبەرابەر شێر بەرگری لەخۆی بکات. ئەگەر بێتە ناو گۆڕەپان، رووبەرووی نوکی ڕم و شمشێر دەبێتەوە، ئەگەر لەڕەی رووبەرووی یەك ببینەوە، سست و لاواز دەبن.

عەلی کوڕی عیسا نامەی بۆ فەرماندارەکانی دەیلەم و تەبەرستان و ناوچەکانی دەوروبەر نووسی و بەڵێنی پاداشتی پێدان، تاج و زێڕ و زیوی فراوانی وەك دیاری بۆ ناردن. فەرمانی پێدان ڕێگەی خوراسان ببەستن. ئەو کارەیان کرد. عەلی هات و لەڕەی نزیك کەوتەوە. عەلی کوڕی عیسا لەڕێگە بەشێوەی پێویست گرنگی بەهێزی دوژمن نەدەدا. دەستەیەك لەهاوەڵانی پێیان وت: ئەگەر سیخوڕەکانی خۆت لەپێشەوە دەنارد و بیرت لەسەنگەر بۆ هێزەکانت دەکردەوە و پێشەنگەکانی خۆت ڕەوانە دەکرد، لەهێرشی لەناکاو پارێزراو دەبوویت. وتی: کەسێکی وەك تاهیر شیاوی ئەوە نییە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین. ئەو دوو ڕێگەی لەبەردەم دایە: یا دەبێت لەڕەی بمێنێتەوە و دانیشتووانی ڕەی دژی ڕاپەڕن و ئێمە لەو ئاسوودە بکەن، یا دەبێت لەڕەی بڕوات و ئەم شارە بەجێبێڵێت و ئەگەر ئەم کارە بکات، سوپاکەی ئێمە لێی نزیك دەبێتەوە. هاوەڵانی عەلی کوڕی عیسا پێیان وت: هەنووکە ئێمە لێی نزیك بووینەتەو، ئەگەر دەیویست شارەکە بەجێبێڵێت، ئەو کارەی دەکرد، بەڵام شارەکەی بەجێ نەهێشتووە. کاتێك دووری نێوانیان گەیشتە دە فەرسەنگ، تاهیر ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵانی کرد. بۆچوونیان وابوو تاهیر لەڕەی بمێنێتەوە و بەرگری بکات تا هێزە یاریدەدەرەکان لەخوراسانەوە بگەن. هەروەها فەرماندەیەك بێت و پێکەوە بتوانن فەرماندەیی سوپاکە بگرنە دەست. هاوەڵانی تاهیر پێیان وت: مانەوە لەڕەی بۆ خۆت و سوپاکە بەسوودترە، دەتوانن کەڵك لەخواردەمەنییەکان وەربگرن و لەسەرما پارێزراون. بەمشێوەیە دەتوانی لەناو ماڵەکان پەنا بگریت و درێژە بەم جەنگە بدەیت. تاهیر وتی: ئەم بۆچوونی ڕاست

نییە، چوونکە دانیشتوانی ڕەی لەعەلی کوڕی عیسا و هێز وگەورەیی ئەو دەترسن. عەرەبی بیابان نشین و چەتەکانی کوێستان و ژمارەیەکی زۆر لەدێهاتییەکان هاوڕێیەتی دەکەن. من دەترسم خەڵکانی ڕەی لەترسی عەلی کوڕی عیسا دژی ئێمە ڕاپەڕن. بۆچوونی ڕاست ئەوەیە ڕووبەڕووی سوپاکەی عەلی کوڕی عیسا ببینەوە، ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، چ باشتر و گەرنە دەگەڕێینەوە بۆ شارەکە و درێژە بەجەنگ دەدەین تا هێزی پشتیوان لەخوراسانەوە بگات.

تاهیر جاڕی جەنگی لەناو سوپاکەی بەرز کردەوە و هاوڕێ لەگەڵ کەمتر لەچوار هەزار شەڕکەر لەڕەی هاتنەدەر. لەپێنج فەرسەنگی ڕەی ئوردوی لێدا. ئەحمەد کوڕی هوشام فەرماندەی پاسەوانەکانی تاهیر هاتە لای و وتی: ئەگەر عەلی کوڕی موسا بێتە لامان و خۆی بەکارگوزاری سەروەری باوەڕداران بناسێنێت، چیتر ناتوانین دژی ئەو بجەنگین چوونکە بەیعەتمان بەخەلافەتی ئەمین داوە. تاهیر وتی: فەرمانی کارگوزاری ئەو بەمن نەگەشتووە. ئەحمەد کوڕی هوشام وتی: ڕێگە بدە، ئەوەی بەراستی دەزانم، ئەنجامی بدەم. وتی: ئەو کارە بکە. ئەو ڕۆشتە سەر مینبەر، ئەمینی لەسەر کارلابرد و مەئمونی وەك خەلیفە ناساند و لەئوردووەکەی خۆیانەوە بەرێکەوتن. دەستەیەك لەهاوەڵانی تاهیر پێیان وت: سوپاکەی تۆ لەسوپای عەلی ترساوە، ئایا باشتر نییە کەمێك ئەم جەنگە دوا بخەین تا سوپاکەی تۆ کەم کەم ئەوان ببینن و هاوشێوەی جەنگێکی ئاسایی لێی بڕوانن و شارەزای چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو سوپایە بن. تاهیر وتی: من لەناشارەزایی و بێ ئاوزی تێك ناشکێم. سوپاکەی من کەمە و سوپای دوژمن بێ ژمار، ئەگەر جەنگ دوا بخەین، لەژمارەی کەمی سوپای ئێمە ئاگادار دەبنەوە و هاوڕێکانی من دەترسێنن و تەماحیان دەخەنە بەردەم و بەمشێوەیە تەمەڵ و تەوەزەڵەکانی سوپاکەم، هاوکاری خۆیان لەمن درێغ دەکەن. من پیادە ڕووبەڕووی پیادەکان و سوارەکان ڕووبەڕووی سوارەکان دەکەمەوە و خۆڕاگری دەکەمە پیشە و بۆ سەرکەوتن پێداگری دەکەم، ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، بەخواستەکەی خۆمان گەیشتووین و ئەگەر پێچەوانەکەی بوو، یەکەم کەسان نین

لەجەنگدا کوژراون. پاداشتەکانی خواوەند لەهەموو شتێك گەورەرتر و فراوانترە.

عەلی کوڕی عیسا لەناو سوپاکەی جاریدا: هێرشیان بکەنەسەر، ژمارەیان کەمە، ئەگەر تیژی شمشێرەکانی ئێوە ببینن، ناتوانن خۆڕاگری بکەن.

عەلی چەپ و راستی سوپاکەی خۆی رازاندەوە دە ئالای هەڵکرد و لەژێر هەر ئالایەك سەد سەرباز. هەر ئالایەك لەگەڵ هێزەکەی خۆی پێشڕەوی دەکرد. دوور دوو ئالا لەیەك بەئەندازەی مەودای تیرێك بوو. فەرمانی بەفەرماندەکانی خۆیدا ئەگەر دەستەی ئالای یەکەم جەنگیان دەستپێکرد و جەنگەکەی درێژەی کێشا، دەستە پشت سەری هاوکاری بکات و دەستەی یەکەم بۆ حەوانەوە پاشەکشێ بکات. ئەو سوپا زریێ پۆشەکەی لەبەرابەر ئالاکان جێگیر کرد و خۆی لەناو هاوەڵانی وەستا.

تاهیریش سوپاکەی خۆی کردە چەندین دەستە و دەستەکانی بەرێخست. لەرێگەدا بۆ جەنگ و هەوڵدان هانی دەدان و رێنوێنی دەکردن و هیوای پێدەبەخشین. ژمارەیەك لەهاوەڵانی تاهیر پەیوەستی سوپاکەی عەلی بوون بەڵام ئەوانی گەڕاندەوە، قامچی لێدان و بەشێوەیەکی توند هەڵس و کەوتی لەگەڵ کردن. ئەحمەد کوڕی هوشام بەتاهیری وت: ئایا بەیعەت لەگەڵ مەئمون لەناو خوراسانییەکان، بیری عەلی کوڕی عیسا ناخەیتەوە؟ ئەو سوێندی خوارد و ئەو بوو ئێمەی بۆ بەیعەت کردن هاندا. تاهیر وتی: ئەگەر کارێکی پەسەندە، جێبەجێی بکە. ئەحمەد کوڕی هوشام پەیمان نامەیەکی بەڕم بەرز کردەوە و لەناو دوو سوپاکەدا وەستا و داوای ئەمانی کرد. عەلی کوڕی عیسا ئەمانی پێدا. ئەحمەد پێی وت: ئایا لەخوا دەترسیت؟ ئایا ئەمە ئەو بەیعەتە نییە خۆت وەرتگرت؟ لەخوا بترسە چوونکە لەمردن نزیك بوویتەوە. عەلی کوڕی عیسا وتی: هەرکەس ئەو بێنێتە لای من، هەزار درهەمی پێ دەبەخشم. هاوەڵانی ئەحمەد جونێیان بەعەلی کوڕی عیسادا. جەنگ دەستی پێکرد. پیاوێك لەسوپاکەی عەلی بەناوی حاتەمی تائیی، هێرشی کردەسەر تاهیر. تاهیر بەهەردوو دەست شمشێرەکەی بەرز کردەوە و لێیدا و کوشتی. دوای ئەوە بەتاهیری (ذوالیمینین)[٩] ناوی دەرکرد.

---

[٩] تاهیرێك کەدوو دەستی راستی هەیە

لەم کاتەدا دانیشتووانی ڕەی بەخێرایی دەرگاکانیان داخست. تاهیر بەهاوەڵانی وت: سەیری ئەوانەی بەردەمتان بکەن نەك ئەوانەی لەپشت سەری ئێوەن چوونکە تەنیا ڕێز گرتن لەپەیمان و هەوڵدان رزگارتان دەکات. شەڕێکی دژوار و قورس دەستی پێکرد. باڵی ڕاستی عەلی هێرشی کردە سەر باڵی چەپی تاهیر بەڵام شکستیان خوارد. دواتر باڵی چەپی عەلی هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی تاهیر کەسوپاکەی تاهیر پاشەکشێی کرد. تاهیر دەنگی بەرز کردەوە: بەهەوڵ و بوێری، هێرش بکەنە سەر دڵی دوژمن چوونکە ئەگەر شکست بەیەك ئاڵای ئەوان بێنن، ئاڵاکانی دیکە شکست دەخۆن. هاوەڵانی تاهیر بوێرانە خۆڕاگرییان کرد و هێرشیان کردە سەر یەکەم ئاڵاکانی دڵی سوپا. ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و باڵی ڕاستی عەلی بەتەواوی شکستی خوارد.

باڵی ڕاست و چەپی تاهیر بوێرییان لەخۆیان نیشاندا و هێرشیان کردە سەر دوژمنانی رووبەرووی خۆیان. شکستی عەلی کوڕی عیسا بەئەنجام گەیشت. ئەو لەناو سوپاکەی دەنگی بەرز کردەوە: هێزە تایبەتەکان لەکوێن؟ ئەو کەسانەی تاج و زێڕ و زیومان پێ بەخشین، لەکوێن؟ دوای هەڵاتن سەر لەنوێ هێرش بەرن. لەم کاتەدا یەکێك لەهاوەلانی تاهیر تیرێکی بۆ هاویشت و لەپێی خست. دەڵێن: ئەم تیرهاوێژە بەداودە ڕەش ناو دەبرا. سەری ئەویان بردە لای تاهیر. دوو دەستیان بەدوو قاچی بەستەوە، ئەویان خستە سەر دارێك و بردیانە لای تاهیر. تاهیر فەرمانیدا بیخەنە ناو چاڵێك و بۆ سپاس کردنی خواوەند بۆ بەخشینی ئەم سەرکەوتنە هەموو کۆیلەکانی خۆی ئازاد کرد. دەنگی شمشێری هاوەڵانی تاهیر بەبەردەوامی بەگوێ دەگەیشت. ئەوان تا دوو فەرەسنگی شوێن هەڵاتووانی سوپاکەی عەلی کەوتن و دوانزە جار هێرشیان کردە سەریان و هەموو جارێك شکستیان بەسوپاکەی ئەمین هێنا. هێزەکانی تاهیر دەیانکوشت و ئەسیریان دەکرد تا ئەوەی شەو جیایی لەنێوان دوو سوپاکەدا دروست کرد. شەڕکەرانی تاهیر تاڵانی فراوانیان دەستکەوت.

تاهیر جاڕیدا: هەرکەس لەدوژمنان شمشێرەکەی فرێبدات، ئەمانی هەیە. ئەوان شمشێرەکانی خۆیان فرێدا و لەچوارپێکان دابەزین. تاهیر بۆ ڕەی گەڕایەوە و بۆ

مەئمون و زوریاستینی نووسی: بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان، ئێستا کەنامە بۆ سەروەری باوەڕداران دەنووسم سەری عەلی کوڕی عیسا لەبەردەممدایە و ئەنگوستیلەکەی لەپەنجەی مندایە وسوپاکەی گوێرایەڵی فەرمانەکانی منن. سلاّوتان لیّ بێت.

پەیك، لەماوەی سێ ڕۆژدا نامەکەی گەیاند. دووری نێوانیان دووسەد و پەنجا فەرسەنگ بوو.

زوریاستین پۆشتە لای مەئمون و پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەی لێکرد و خەلافەتی ئەوی بەپیرۆز لەقەڵەمدا. دوو ڕۆژ دوای نامەکەی سەری عەلی کوڕی عیسا گەیشتە بارەگای مەئمون. مەئمون فەرمانیدا سەری ئەو بەخوراساندا بگێڕن.

کاتێك هەواڵی سەرکەوتن بەمەئمون گەیشت، ئەو سەرقاڵی ئامادە کردنی سوپاکەی هەرسیمە کوڕی ئەعیەن بۆ هاوکاری تاهیر بوو. ئەمین سەرقاڵی ڕاوە ماسی بوو کە لەکوژرانی عەلی کوڕی عیسا ئاگاداریان کردەوە. ئەو بەو سەربازەی ئەم هەواڵەی بۆ هێنا، وتی: نفرینی خوات لیّ بێت، بڕۆ، کەوسەری خزمەتکار دوو ماسی گرتووە و تا ئێستا من ماسیم نەگرتووە.

دواتر فەزڵ کوڕی ڕەبیع کەسی بەدوای نەوفلی خزمەتکار نارد تا بیگرن. نەوفل کارگوزاری مەئمون لەسنوورەکانی عێراق و سەرپەرەستی منالّەکانی ئەو لەعێراق بوو. هەزار هەزار پاداشتی ڕەشید بۆ مەئمون لەدەستی ئەو دابوو. ئەو هەموو سامانەکانی وەرگرت و دەستی بەسەر زەوی و دانەوێڵەکانی ئەودا گرت. بەدوای ئەم کردەوەی ئەمین یەکێك لەشاعیرانی بەغداد وتی:

| | |
|---|---|
| اضاع الخلافة غش الوزير | و فسق الامير و جهل المشير |
| ففضل وزير و بكر مشير | يريدان ما فيه حتف الامير |
| و ما ذاك الا طريق غرور | و شر المسالك طرق الغرور |

واتاکەی: فریوکاری وەزیر و خراپەکاری پاشا و نەزانی ڕاوێژکار، خەلافەتی بەرەو گەندەڵی برد. فەزڵ وەزیرە و فلاّنە ڕاوێژکار، هەردووك خوازیاری شتێکن کەلەناوچوونی خەلیفەی تیا حەشار دراوە. ئەمە تەنیا ڕێگەی خۆپەسەندییە و خراپترین ڕێگەکان هەمان ڕێگەی خۆپەسەندییە.

چەند شێعرێکی دیکەیش هۆنرانەوە بەڵام بەهۆی زمان خراپی ئەوان من (کوڕی ئەسیر) ئاماژەم پێ نەدان. سەرم لەباوکی جەعفەری تەبەری سورماوە چۆن ئەو هۆنراوانەی لەکتێبەکەی خۆیدا باس کردووە. ئەمین لەفریوکاری و خراپەکاری خۆی پەنجەی دەخوارد. سەرکردەکان وفەرماندەکان لەنیوەی شەوالی ئەم ساڵە/دەی ژوئیەی زایینی ڕۆشتنە لای یەك و بۆ وەرگرتنی موچە و شۆڕش یەکیان گرت و ئەو کارەیان کرد بەڵام ئەمین، دوای جەنگی عەبدوالله کوڕی خازم لەوان، ڕێگەی جەنگی لە عەبدوالله گرت و سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا دابەش کرد.

## ڕەوانە کردنی عەبدولرەحمان کوڕی جەبەلە

کاتێك هەواڵی کوژرانی عەلی کوڕی عیسا و شکستی سوپاکەی بەئەمین گەیشت، عەبدولرەحمان کوڕی ئەنباری لەگەڵ بیست هەزار سەرباز بۆ هەمەدان ڕەوانە کرد و فەرمانداری ئەو شارەی پێسپارد. مژدەی پێدا دەست بەسەر هەر شارێکی خوراساندا بگرێت، خۆی دەبێتە فەرماندەی. ئەمین فەرمانی پێدا بۆ ئەم مەبەستە هەوڵ بدات. سامانێکی زۆری خستە بەردەست. عەبدولرەحمان ڕێگەی هەمەدانی گرتەبەر و ڕۆشتە ناو شارەکە. سەنگەری بەدەوردا هەڵکەند ودیواری شارەکەی نۆژەن کردەوە.

تاهیر و سوپاکەی بەرەو هەمەدان بەرێکەوتن. عەبدولڕەحمان کەهێزی ئامادە کردبوو، ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕێکی مەترسیدار دەستی پێکرد. هەردوو سوپا خۆڕاگرییان کرد و ژمارەی کوژراو و بریندارى هەر دوو سوپا فراوان بوو. عەبدولرەحمان شکستی خوارد و پەنای بردە هەمەدان. چەند ڕۆژێك لەناو شارەکە مایەوە تا شەڕکەران هێزیان گرت و بریندارەکان چاکبوونەوە. دووبارە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی تاهیر. تاهیر کاتێك ئەوانی بینی، بەسوپاییەکانی وت: شەڕی ئێوە لەگەڵ ئەو دوو ڕووی هەیە: ئەگەر لێیان نزیك ببنەوە و شکستیان پێ بێنن، بۆ ناو شارەکە پاشەکشێ دەکەن و لەدەوروبەری سەنگەرەکە لەگەڵتان دەجەنگن و ئەگەر ئێوە شکست بدەن، گۆڕەپانێکی بەرینتریان دەست دەکەوێت. کەواتە لەنزیك

ئوردووگا و سەنگەری خۆتان بمێننەوە و ئەگەر لێمان نزیك بوونەوە، دەجەنگین.

ئەوان لای سەنگەرەکانی خۆیان مانەوە. عەبدولرەحمان گومانی برد هێزی ئەوان ورەی سوپاکەی تاهیری لەناو بردووە و بەم پێیە، لێیان نزیك کەوتەوە. جەنگێکی قورس دەستی پێکرد. هەر دوو لای خۆڕاگرییان کرد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی عەبدولرەحمان کوژران. عەبدولرەحمان بەدەوری سوپاکەیدا دەسوڕایەوە و هانی دەدان و داوای دەکرد خۆڕاگر بن. یەکێك لەسەربازەکانی تاهیر هێرشی کردە سەر ئاڵادارەکەی عەبدولرەحمان و کوشتی. هاوەڵانی تاهیر هێرشیان برد. سوپاکەی عەبدولرەحمان شکستی خوارد. خوێنی سوپاکەی عەبدولرەحمان لەشمشێری سەربازەکانی تاهیر دەچۆڕا تا خۆیان گەیاندە شارەکە. تاهیر دەوری دەروازەکەی گرت. ئەم گەمارۆیە لای ئەوان دژوار بوو و تەنگی بەدانیشتووانەکەی هەڵچنی. عەبدولرەحمان ترسا لەوەی خەڵکی شارەکە شۆڕش بکەن (هەرچەند هاورێکانی هەموو هەوڵێکیان دەدا). بەمشێوەیە بۆ خۆی و سوپاکەی داوای ئەمانی کرد. تاهیر ئەمانی پێبەخشی ولەهەمەدان ڕۆشتەدەر.

## زاڵبوونی تاهیر بەسەر کەنارەکانی کوێستان

کاتێك تاهیر گەیشتە دەروازەی هەمەدان و گەمارۆی خستە سەر عەبدولرەحمان، ترسا لەوەی کەسیر کوڕی قادرە لەقەزوێنەوە هێرشی بکاتە سەر. لەبەر ئەمە فەرمانی بەسوپاکەیدا ئامادەبن. خۆی لەگەڵ هەزار شاسوار رووی کردە قەزوێن. کاتێك کەسیر کوڕی قادرە لەهاتنی تاهیر ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ سوپاکەی هەڵاتن و قەزوێنیان بەجێهێشت. تاهیر لەوێ سوپایەکی دانا و پیاوێك لەهاوەڵانی خۆی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدا مۆڵەتی هاتنە ناو شارەکە بەکەس نەدات. تاهیر بەسەر هەموو ناوچە کوێستانییەکاندا زاڵبوو.

## چۆنیەتی کوژرانی عەبدولرەحمان کوڕی جەبەلە

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی جەبەلەی ئەنباری کوژرا. هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو کاتێك ئەمانی لەتاهیر وەرگرت، وای نیشان دەدا دژایەتی تاهیر و هاوڕێکانی ناکات و بەئاشتی لەگەڵیان دەجووڵێتەوە و لەئەمانەکەی تاهیر رازییە. رۆژێك کاتێك هاوەڵانی تاهیر لێی بێ ئاگا بوون، فریویدان و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی هێرشی کردە سەر تاهیر و هاوڕێکانی بەڵام پیادەکانی تاهیر رووبەروویان بوونەوە و خۆڕاگرییان کرد تا سوارەکان بۆ جەنگ ئامادە بوون. قورسترین شەڕیان نیشاندا. لەم شەڕەدا شمشێرەکان لەت لەت و ڕمەکان شکان. عەبدولرەحمان شکستی خوارد بەڵام لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی لەجەنگ بەردەوام بوو. هاوەڵانی عەبدولرەحمان پێیان وت: تۆ دەتوانی رابکەیت، رابکە. لەوەڵامدا وتی: سەروەری باوەڕداران هیچ کات روخساری تێکشکاوی من نابینێت. جەگی تا ئەوەی خوێنی خۆی بینی.

هەڵاتووانی سوپاکەی عەبدولرەحمان خۆیان بەسوپاکەی عەبدوالله و ئەحمەد دوو کوڕەکەی حەرەشی گەیاند. ئەم دوو برا لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەکۆشکی لەسوس(لصوص) ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەمین ئەوانی بۆ هاوکاری عەبدولرەحمان ناردبوو. کاتێك هەڵاتووان گەیشتنە لایان، بێ هیچ جەنگێك رێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر و خۆیان گەیاندە بەغداد و بەمشێوەیە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوان بۆ تاهیر مایەوە. تاهیر یەك یەك دەستی بەسەر شار و ئاوەدانییەکاندا گرت تا گەیشتە شەلاشان لەگوندەکانی حیلوان. لەوێ سەنگەریان هەڵکەند و هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە.

## شۆڕشی سوفیانی

لەم ساڵەدا سوفیانی یا هەمان عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. دایکی ئەو نەفیسە کچی عوبەیدالله کوڕی عەباس کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. دەیوت: من زادەی دوو پیری

سەفین یانی عەلی و معاویەم. نازناوی ئەو باوکی عومەیتەر بوو چوونکە ڕۆژێك بەهاودەمەکانی خۆی وت: نازناوی حەرزون (هەتاو پەرەست) چییە؟ وتیان: نازانین. وتی: نازناوی ئەم ئاژەڵە عومەیتەرە. هاورێکانی چیتر بەباوکی عومەیتەر ناویان دەبرد.

کاتی شۆڕشەکە لەمانگی زیحەججە/مەی، خۆی وەك خەلیفە ناساند. ئەو بەسەر سلێمان کوڕی مەنسور کاگوزاری دیمەشقدا سەرکەوت و ئەوی لەشارەکە دەرکرد. خەتاب کوڕی وەجە فولس موالی منداڵەکانی ئومەییە هاوکاری دەکرد. ئەو پێشتر دەستی بەسەر سیدا گرتبوو. کاتێك سوفیانی سەری بەرز کردەوەو، ئەمین، حسەین کوڕی عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. ئەو تا ڕەققە پێشڕەوی کرد بەڵام نەیتوانی بگاتە دیمەشق.

عومەر کوڕی باوکی عومەیتەر نەوەد ساڵە بوو ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. خەڵکان حەدیس و زانستی زۆر لەو فێر ببوون. ئەو پیاوێکی چاکەکار بوو بەڵام کاتێك شۆڕشی کرد ڕێگەی ستەمکاری گرتەبەر و هەڵس و کەوتەکانی خراپ بوون. خەڵکان هەموو زانست و حەدیسەکانی ئەویان لەبیر بردەوە.

زۆرینەی هاورێکانی لەهۆزی منداڵەکانی کەلب بوون. نامەیەکی بۆ محەممەد کوڕی ساڵح کوڕی بەیهەسی کەلابی نووسی و داوای لێکرد گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێت. ئەوی ترساند ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی نەبێت، ئەمە و ئەوە دەکات بەڵام ئەو وەڵامی سوفیانی نەدایەوە. لەم کاتەدا سوفیانی مەبەستی قەیسییەی کرد، خەڵکان نامەیەکیان بۆ محەممەد کوڕی ساڵح نووسی و چاوەڕوانی هاوکاری بوون. محەممەد کوڕی ساڵح لەگەڵ سێسەد شاسوار لەهۆزی منداڵەکانی زەبباب و موالییەکانی خۆی ڕووی کردە قەیسییە. سوفیانی ئاگادار بوویەوە و یەزید کوڕی هوشامی لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کوڕی بەهیس ڕەوانە کرد. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەك بوونەوە و سوپاکەی یەزید شکستی خوارد و بۆ دەروازەکانی دیمەشق پاشەکشێیان کرد. زیاتر لەدوو هەزار کەسیان لێ کوژرا و سێ هەزار کەسیان بریندار بوون. کوڕی بەهیس سەر و ریشی ئەسیرەکانی تاشی و ئەوانی ئازاد کرد.

سوفیانی ناتەوان و لەدیمەشق گەمارۆی خرایەسەر. ئەو لەوێ هێزێکی کۆکردەوە و قاسمی کوڕی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد. ئەوان بۆ جەنگی کوڕی بەهیس دیمەشقیان بەجێهێشت. دوو سوپا رووبەرووی یەك بوونەوە. قاسم کوژرا و سوپاکەی سوفیانی شکستی خوارد. سەری براوی قاسم بۆ ئەمین نێردرا. سوفیانی سوپایەکی دیکەی کۆکردەوە و بەفەرماندەیی موعتەمەری موالی خۆی، ڕەوانەی جەنگی کرد. ئەم سوپا رووبەرووی سوپاکەی کوڕی بەهیس بوویەوە. موعتەمەر کوژرا و دووبارە سوپاکەیان شکستی خوارد. جڵەوی کارەکان لەدەستی سوفیانیدا نەما و منداڵەکاتی قەیس چاوی تەماحیان تێبڕی.

لەم کاتەدا کوڕی بەهیس نەخۆش کەوت. ئەو سەرکردەکانی منداڵەکانی نومەیری کۆکردەوە و پێی وتن: نەخۆشییەکەی من دەزانن. دوای من چاکە لەگەڵ منداڵەکانی مەروان بکەن و مەسلمە کوڕی یەعقوب کوڕی محەممەد کوڕی سەعید کوڕی مەسلەمە کوڕی عەبدولمەلیك بپارێزن چوونکە خوشکەزای ئێوە (دایکی لەهۆزی ئێوەیە) و ناتەوانە. پێی بڵێن نابنە شوێنکەوتەی منداڵەکانی باوکی سوفیان، دەستی بەیعەت بخەنە ناو دەستی مەسلیمە و بەهاوکاری ئەو سوفیانی لەناو ببەن.

کوڕی بەهیس بۆ حوران گەڕایەوە. هۆزی نەمیر بۆ مەسلیمە بەیعەتیان وەرگرت. ئەویش بەبەیعەتی ئەوان رازی و موالییەکانی خۆی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر سوفیانی و دیلی کرد. سەرکردەی منداڵەکانی ئومەییەیشی دەستگیر کرد و ئەوان بەیعەتیان لەگەڵ بەست. منداڵەکانی قەیسی لەخۆی نزیك کردەوە و ئەوانی کردە کەسە تایبەتەکانی خۆی. کاتێك کوڕی بەهیس لەنەخۆشییەکەی رزگاری بوو، گەڕایەوە بۆ دیمەشق و دەوری شارەکەی گرت. منداڵەکانی قەیس گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون و مەسلیمە و سوفیانی لەناو جل و بەرگی ژنان بۆ موڕە هەڵاتن. ئەم رووداوە لەمانگی موحەرەمی ساڵی سەد و نەوەد و هەشت/ سێپتامبەری زاییینی روویدا. کوڕی بەهیس ڕۆشتە ناو دیمەشق و دەستی بەسەردا گرت و لەوێ مایەوە تا عەبدوالله کوڕی تاهیر هاتە دیمەشق. ئەو ڕۆشتە میسر و جارێکی

دیکە گەڕایەوە بۆ دیمەشق و کوڕی بەهیسی لەگەڵ خۆی بۆ عێراق برد. کوڕی بەهیس تاکاتی مردن لەعێراق مایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

فەرمانداری مەککە و مەدینە بەنوێنەرایەتی ئەمین، داود کوڕی عیسا کوڕی موسا بوو کە لەساڵی ٨٠٨/١٩٣ زایینی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزاری کوفە، عەباس کوڕی هادی و کارگوزاری بەسرە مەنسور کوڕی مەهدی بوو.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی خازم و باوکی معاویەی زەڕیری شیعی، مردن.

لەم ساڵەدا باوکی نەواس حەسەن کوڕی هانی وتاردەری بەناوبانگ (ئێرانی نەژاد) لەتەمەنی پەنجا و نۆ ساڵیدا مرد و لەگۆڕستانی شونیزی بەغداد بەخاك سپێردرا.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی غەزوان کوڕی جەریری زەببی موالی منداڵەکانی زەببە و یوسف کوڕی ئیسبات باوکی یەعقوب، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و شەشی کۆچی ( ٨١١ زایینی )

## ڕەوانە کردنی سوپاییەکان بەفەرمانی ئەمین بۆ جەنگی تاهیر و گەڕانەوەی ئەوان بێ ڕوودانی جەنگ

لەم ساڵەدا ئەمین، ئەسەد کوڕی یەزید کوڕی مەزید و مامەکەی، ئەحمەد کوڕی مەزید و عەبدوالله کوڕی حومەید کوڕی قەحتەبەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ تاهیر بۆ حیلوان ڕەوانە کرد.

هۆکاری ئەم هێرشە بەوتەی ئەسەد ئەوە بوو کاتێك عەبدولرەحمان کوژرا، فەزڵ کوڕی ڕەبیع کەسی بەدوای مندا نارد، ڕۆشتمە بارەگاکەی. دانیشتبوو و نامەیەکی لەدەستا بوو و دەیخوێندەوە. چاوی ببوو بەگۆمی خوێن و ئاگری تورەیی بڵێسەی دەسەند، دەیوت: وەك مریشك دەخەوێت و هاوشێوەی گورگ لەخەو هەڵدەستێت (یانی ئەمین) و تەنیا بیر لەسکی دەکاتەوە. سەرقاڵی گەمە کردن لەگەڵ سەگ و ڕاو کردنە، بیر لەوە ناکاتەوە پێگەکەی لەدەست دەدا، بۆ بڕیارێکی ڕاست بۆچوون ناکات. خواردنەوەی مەی ئەوی سەرقاڵ کردووە و تەنیا بیر لەپیاڵە دەکاتەوە و گەمە کردن پشتگوێ ناخات. ڕۆژگار مەبەستی لەناو بردنی ئەوی کردووە و مەئمون خۆی بۆ لەناو بردنی ئەو ئامادە کردووە. مەرگ دەیەوێت گیانی بگرێت. مەئمون مەرگی لەسەر پشتی ئەسپەکان ئامادە و لەسەر نوکی شمشێر و ڕمەکان بەرزی کردۆتەوە. ئەوسا وتی: هەمووان لەلای خواوەندەوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. ئەم هۆنراوەی بەعیسی هێنایە سەرزمان:

| | |
|---|---|
| ومجدولة جدل العنان خريدة | لها شعر جعد و وجه مقسم |
| و ثغر نقى اللون عذب مذاقه | يضى ء له الظلما ساعة تبسم |
| و ثديان كالحقين و البطن ضامر | خميص و جهم نارة تتضرم |
| لهوت بها ليل التمام ابن خالد | و انت بمرو الروذ غيظا تجرم |
| اظل اناغيها و تحت ابن خالد | امية نهد المركلين عثمثم |
| طواه طراد الخيل فى كل غارة | لها عارض فيه الاسنة ترزم |

يقارع اتراك ابن خاقان ليله | الى ان يرى الاصباح ما يتلغم
فيصبح من طول الطراد و جسمه | نحيل واضحى فى النعيم اصمم
اباكرها صهبا كالمسك ريحها | لها ارج فى دنها حين يرسم
فشتان ما بينى و بين ابن خالد | امية فى الرزق الذى الله يقسم

واتاكەی: دڵداری پرچی هۆنیەوەتەوە هاوشێوەی کیژێك بەمووی فڕ و لوول وەك بڵێی جوانی روخساری ئەو چەند لایەنە. ددانی خۆشڕەنگ و لێو و زارێکی شیرین کەهەرکات بزە دەگرێت، تاریکی رووناك دەبێتەوە. دوو مەمکی ئەو هاوشێوەی مینایە بەنێوانێکی باریك و مۆنییەك کەئاگرەکەی سەری دەرهێناوە. لەشەوێك کەکوڕی خالید (ئەسەد کوڕی خالید فەرمانڕەوای خوراسان) سوار ئەسپێکی چالاك بوو، سەرقاڵی عەشقبازی لەگەڵ ئەو دڵدارە بووم و تۆ لەو کاتەدا لەمەرو رووباری توڕەیی دادەمرکاندەوە. من زاری عەشقم بەئومەییە دەدۆڕاند و کوڕی خالید سوار ئەسپێکی سەرکێش و لەڕ بوو (ڕەنجی زۆری دەبرد) ئەو رووبەرووی هێرش کردنی سوارە ڕم بەدەستەکان و جەنگاوەرەکان دەبوویەوە و دەکەوتە کەنارێك. ئەو سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ تورکەکان و مناڵەکانی خاقان بوو و بەجەنگ و دژواری بەیانی دەکردە شەو. ئەو لەبەرەبەیانی ئەو رووداوە ناتەوان و پەرێشان لەسوچێکدا دەکەوت و من لەنازو و نیعمەت و خۆشگوزەرانیدا بووم. پیاڵەی من بوو بادەی مەستکەر بوو کەبۆنی موشکی لێ دەهات دەتوت لەگۆزەی ئەم بادە، بۆنی خۆشیان ڕژاندبوو. ئەی ئومەییە (دڵدار) لەرۆژییەی خواوەند دابەشی کردووە، دووریەکی زۆر دەبینرێت لەنێوان من و کوڕی خالید. (نیعمەتی بەمن داوە و ڕەنجی بەو.)

فەزڵ رووی کردە من و وتی: ئەی باوکی حارس، من و تۆ گەشتووینەتە کۆتاییەك ئەگەر کەمتەرخەمی بکەین، سەرکۆنە دەکرێین و ئەگەر لەم رێگادا تێبکۆشین، دەتوانین گوزەر بکەین. ئێمە بەڕیشەیەك بەستراوینەتەوە ئەگەر بەهێز ببێت، بەهێز دەبین و ئەگەر ناتەوان بێت، لاواز دەبین. ئەم پیاوە، هاوشێوەی کەنیزێکی نەزان خۆی گرفتار کردووە و راوێژ بەژنان دەکات و هیچ کارێك ناکات مەگەر بەپێی گومان و خەیاڵ. مەی خۆرەکان و گۆرانیبێژەکان لەدەوری ئەو

کۆبوونەتەوە و ئەم کەسانە مژدەی سەرکەوتنی پێ دەدەن و ڕۆژەکانی داهاتووی بۆ دەرازێننەوە. خێرایی لەناوچوون بۆ ئەو زیاتر لەخێرایی لافاو بۆ شوێنە نزمەکانی زەوییە. سوێند بەخوا دەترسم لەگەڵ ئەو ئێمەیش لەناو بچین و بەمەرگی ئەو کۆتایی بەژیانی ئێمەیش بێت. تۆ شاسواری عەرەبەکانیت و باوکیشت لەشاسوارەکان بوو. لەم کارە دژوارەدا پەنا بۆ تۆ دەبرێت و هەنووکە ئەم پیاوە پەنای بۆ تۆ هێناوە و چاوەڕوانی دوو مەبەستە: یەکەم ڕاستی و دروستی تۆ لەفەرمانبەری و ئامۆگاری کردن و چاکەخوازی، دووەم بەهادار بوونی بنەماڵە و بوێری و هێزی جەنگی تۆ. داوای لەمن کردووە نیازەکانی تۆ بەدیبێنم و دەستت بۆ هەموو شتێك ئاوەڵا بکەم، بەڵام میانڕەوی، بناغەی هەر چاکەخوازییەك و کلیلی هەر پیرۆزییەکە. نیازەکانت دابین بکە و هێرش بکە سەر دوژمن، هیوادارم خواوەند سەرکەوتنت پێ ببەخشێت و بەهۆی هێزی تۆوە، کاروباری ئەم خەلافەتە سامان بگرێت.

وتم: فەرمانی تۆ و سەروەری باوەڕدارانم بیست، هەوڵ دەدەم ڕووبەڕووی دوژمنی ئەو و تۆ ببمەوە و جل و بەرگی لاوازی و سستیان لەبەر بکەم. بەڵام سەربازی جەنگاوەر هەرگیز ڕێگەی فرت و فێڵ ناگرێتەبەر و بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی کەمتەرخەمی لەخۆی نیشان نادات. داوا دەکەم فەرمان بدەیت مووچەی یەك ساڵی سوپاکەی من بدەن و موچەی یەك ساڵیش بکەیتە هاورێیان و پێگەیەکی تایبەت بەجەنگاوەرە بێ نیازە خاوەن ئەزمونەکان ببەخشیت و لەهێزە سست و ناتەوانەکان جیایان بکەیتەوە و هەزار کەس لەسوپاکەی من سوارە بن. هەروەها ئەو شارە و ئاوەدانییەی دەستی بەسەردا دەگرم، بۆ سامان و دارایی ئەو ناوچانە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ نەکرێت و کەس پرسیاری خەرجییەکانی من نەکات. فەزڵ کوڕی ڕەبیع وتی: زێدەڕۆییت کرد و زیادەت داوا کرد. دەبێت لەگەڵ سەروەری باوەڕداران گفتوگۆ بکەم. سوار ئەسپەکانی خۆمان بووین، پێش من ڕۆشتە لای ئەمین و مۆڵەتی ڕۆشتنە ژوورەوەی بۆ من وەرگرت. تەنیا دوو وتەم هێنایە سەرزمان، ئەمین تورە بوو و فەرمانی زیندانی کردنی منیدا.

دەڵێن: ئەسەد کوڕی یەزید داوای لەئەمین کرد منداڵەکانی مەئمون بەو بسپێرێت

تا ئەگەر مەئمون گوێرایەڵی فەرمانەکانی نەبوو، خوێنی منداڵەکانی برێژێت. ئەمین پێی وت: تۆ بیابان نشینی نەزانیت، داوا لەتۆ دەکەم جڵەوی عەرەب و ناعەرەبەکان بگریتە دەست و باجی ئاوەدانییەکانی کوێستانەکانی خوراسان بەتۆ دەبەخشم و پێگەی تۆ لەناو فەرماندەکاندا بەرز دەکەمەوە و تۆ پێشنیاری کوشتنی منداڵەکان و بنەماڵەکەم پێ دەکەیت. ئەمە تەنیا نیشانەی نەزانی و بێ ئاوزی تۆیە.

دوو منداڵەکەی مەئمون لەگەڵ دایکیان، دایکی عیسا کچی هادی (مامی مەئمون) لەبەغداد ژیانیان بەسەر دەبرد. مەئمون لەکاتی ئارامی داوای لەبراکەی کردبوو ئەوان بۆ لای خۆی بیات بەڵام ئەمین رازی نەبوو و دەستی بەسەر داهاتی زەوییەکانی ئەوان گرت.

کاتێك ئەمین ئەسەدی زیندانی کرد، وتی: ئایا لەبنەماڵەکەی کەس هەیە جێگەی بگرێتەوە، حەز ناکەم ئەم بنەماڵەیە کەنەژادیان ناسراوە، پەرێشان بکەم. وتیان: بەڵێ، ئەحمەد کوڕی مەزید مامی ئەوە و چاکەکارترینی ئەوانە. هەم بوێرە و هەم خاوەن شکۆ و شارەزای جەنگە. ئەمین کەسی بەدوای ئەودا نارد و ئەو هاتە لای فەزڵ. عەبدوالله کوڕی حومەید کوڕی قەحتەبەیش لەگەڵی هات. فەزڵ دەیویست ئەو بۆ جەنگی تاهیر ڕەوانە بکات. عەبدوالله کەلەوێ بوو، خۆی لەم کارە دوور دەخستەوە. ئەحمەد دەڵێت: کاتێك فەزڵ منی بینی، ڕێزی لێگرتم و لەسەرەوە داینیشاندم. ڕووی کردە عەبدوالله و بەگاڵتە وتی:

| | |
|---|---|
| انا وجدنا لكم اذ رث حبلكم | من آل شيبان اما دونكم و ابا |
| الا كثرون اذا عد الحصى عددا | والاقربون الينا منكم نسبا |

واتاکەی: هەرکات تەناف ئێوە ڕزا، لەبنەماڵەی شەیبان کەسێك دەدۆزینەوە کەدایك و باوکیان لەپێشتر لەئێوەن. هەرکام سەرژمێری بکەن، زیاترن و گەوهەری ئەوان لەئێوە بەئێمە نزیکترە.

عەبدوالله وتی: سوێند دەخۆم ئەوان بەو شێوەن و کەلێنەکان بەوان پڕ دەبنەوە، ئەوان دوژمن ریسوا دەکەن و خراپەکارە یاخییەکان سەرکوت دەکەن. فەزڵ بەئەحمەدی وت: سەرۆەری باوەڕداران تۆی بیرکەوتەوە و منیش وەسفی تۆم

کرد، سەروەری باوەڕداران دەخوازێت چاکەت لەگەڵ بکات و نازناوی تۆ بەرز بکاتەوە و پێگەیەکی بەرزت پێ ببەخشێت بەشێوەیەك کەس لەبنەماڵەکەت تا ئێستا ئەو پێگەی بەدەست نەهێناوە. پێکەوە ڕۆشتینە دەرباری ئەمین و ڕۆشتینە لای ئەو. ئەمین پێی وتم کەئەسەدی زیندانی کردووە و بۆ ئەم کارە داوای بەخشینی کرد. فەرمانی پێدام بۆ جەنگی تاهیر بەرێکەوم. وتم: بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی سەروەری باوەڕداران خوێنی خۆم دەرێژم و لەجەنگ دژی دوژمنانی ئەو هەوڵ دەدەم و هیوادارم چاوی ئەو بەتواناییەکانی خۆم روون بکەمەوە.

فەزڵ فەرمانیدا هەرکام لەسوپاییەکان کەدەخوازێت، هەڵیبژێرێت. هەروەها فەرمانی پێدا بەوپەڕی خێرایی رێگە ببڕێت. ئەحمەد بیست هەزار شەڕکەری هەڵگرت و عەبدوالله کوڕی حومەید کوڕی قەحتەبەیش لەگەڵ بیست هەزار شەڕکەر لەمناڵەکان (مناڵی ئێرانییەکان کەخەلافەتی عەباسییان پێکهێنا) هاورێیەتی دەکرد. هەردوو سوپا بەرەو حیلوان کەوتە رێ.

ئەحمەد نێوەنجیگەری بۆ برازاکەی، ئەسەد، کرد و ئەمین ئەوی لەزیندان هێنایە دەر. ئەحمەد و عەبدوالله لەخانەقین ئوردوویان لێدا. تاهیر لەشوێنەکەی خۆی مایەوە و سیخوڕەکانی خۆی نارد و ئەم وتەی لەناو ئوردووی ئەحمەد و عەبدوالله بلاو کردەوە کەئەمین رۆژانەی بەرچاوی بۆ هاورێیانی خۆی دیاریکردووە و پاداشتی بۆ لەبەر چاو گرتوون. بەردەوام هەوڵیان دەدا ئاگری دووبەرەکی لەنێوان سوپاکەی ئەواندا هەڵگیرسێنن تا ئەوەی ناسازگاری لەنێوان سوپاییەکان دەستی پێکرد و بۆ جەنگی یەك شمشێریان لەکالان دەرکێشا و بێ ئەوەی رووبەرووی تاهیر ببنەوە، لەخانەقینەوە گەڕانەوە. تاهیر پێشڕەوی کرد و لەحیلوان دابەزی و ماوەیەکی زۆری نەخایاند هەرسیمە لەگەڵ سوپایەك لەلایەن مەئمونەوە پەیوەستی بوو. ئەو هەڵگری نامەیەکی مەئمون بوو کەفەرمانی دەدا شار و ئاوەدانییە دەست بەسەردا گیراوەکان بەهەرسیمە بسپێرێت و خۆی بەرەو ئەهواز بڕوات. تاهیر ئەو کارەی کرد و هەرسیمە لەحیلوان مایەوە و سەنگەری هەڵکەند. تاهیر بەرەو ئەهواز بەرێکەوت.

بەرزبوونەوەی پێگەی فەزڵ کوڕی سەهل

لەم ساڵەدا لەناو خوتبەکان وەك خەلیفە ناوی مەئمونیان دەبرد. ئەو پێگەی فەزڵ کوڕی سەهلی بەرز کردەوە.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك لەهەواڵی کوژرانی کوڕی ماهان و عەبدولرەحمان کوڕی جەبەلە ئاگادار بوویەوە و لەراستی هەواڵەکە دڵنیا بوو، فەرمانیدا بەناوی ئەو خوتبەی خەلافەت بخوێنن و بەسەروەری باوەڕداران ناوی ببەن. ئەو فەزڵ کوڕی سەهلی بانگ کرد و فەرمانڕەوایی رۆژهەلات زەمین کەدرێژییەکەی لەکوێستانەکانی هەمەدان تا کەنارەکانی تبت و پانییەکەی لەدەریای فارس تا دەریای دەیلەم و جەرجان بوو، بەو سپارد و سێ هەزار درهەمی وەك پاداشت بۆ دیاریکرد و ئالأی ئەوی لەسەر دوو ڕم بەرز کردەوە (دوو سەرۆکایەتی) و نازناوی زوریاستینی پێبەخشی چوونکە هەم سەرۆکایەتی سوپای دەکرد و هەم سەرۆکایەتی ولأت. ئالأکەی ئەو لەسەر شانی عەلی کوڕی هوشام بوو. حەسەن کوڕی سەهل سەرۆکایەتی دیوانی لەئەستۆدا بوو.

## مردنی عەبدولمەلیك کوڕی ساڵح کوڕی عەلی

پێشتر ئامارژەمان بەوەدا کەڕەشید، عەبدولمەلیك کوڕی ساڵحی زیندانی کرد. ئەو لەزیندان مایەوە تا کاتی مەرگی ڕەشید. کاتێك ئەمین لەزی قەعدە ساڵی ١٩٣/ئوتی ٨٠٩ زایینی لەسەر تەخت دانیشت، ئەوی لەزیندان هێنایەدەر و چاکەی لەگەڵ کرد.

. کاتێك پێشهات و جەنگەکاتی تاهیر روویدا، عەبدولمەلیك ڕۆشتە لای ئەمین و پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەبینم خەڵکان چاوی تەماحیان تێبڕیویت و سوپاکەی تۆ گرفتاری دەعباکان بووە و جەنگ ئەوانی لاواز کردووە و لەدوژمن دەترسن. ئەگەر بۆ جەنگی تاهیر ڕەوانەیان بکەیت، ئەو بەسوپایەکی کەم شکست بەسوپاکەی تۆ دێنێت و بەمەبەستێکی بەهێز بەسەر لاوازی و ناتەوانی سوپاکەی تۆدا زاڵ دەبێت. شامییەکان خەڵکانێکن جەنگ ئەوانی بەئەزمون کردووە و سەختی و دژوارییەکان ئەوانی پەروەردە کردووە. هەموویان فەرمانبەری منن و بۆ

فەرمانبردن لەمن کێبڕکێ دەکەن. ئەگەر سەروەری باوەڕداران من بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکات، سوپایەکی گەورەیان لێ دروست دەکەم و زیانێکی گەورە بەسەر دوژمن دەهێنم.

ئەمین فەرمانڕەوایی شام و جەزیرەی پێسپارد و بەسامان و سەرباز هاوکاری کرد. ئەوی ڕەوانە کرد.

عەبدولمەلیك هات و گەیشتە ڕەققە و لەوێ نامەی بۆ سەرکردە و گەورەکانی شام نووسی. سەرکردە و گەورەکان یەك لەدوای یەك و دەستە دەستە دەهاتنە لای. عەبدولمەلیك ڕێزی لێگرتن و مژدەی پێدان و سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا بڵاو کردەوە. بەمشێوەیە ژمارەیان زیادی کرد بەڵام لەم کاتەدا عەبدولمەلیك نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی بەرەو دژواری ڕۆشت.

یەکێك لەسەربازانی خوراسان کە لەئوردووی شامدا بوو، چوارپێکەی خۆی لەدەستی یەکێك لەدزەکانی شامدا بینی. لەجەنگێکدا سلێمان کوڕی جەعفەر چوارپێکەی ئەوی وەك تاڵانی بردبوو. دەستی بەسەر چوارپێکەدا گرت. دەستەیەك لەدزەکان و سوپاییەکان لەدەوریان کۆبوونەوە و پەلاماری یەکیاندا. کوڕەکان (مناڵی ئێرانییەکان) هاتن و هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە و لەناکاو هێرشیان کردە سەر دزەکان. ئەسپەکانی ئەوانیان گرت و ئاگری جەنگیان خۆش کرد.

عەبدولمەلیك لەم دەرگیرییە ئاگادار بوویەوە. پەیکی بۆ لای ئەوان نارد و داوای لێکردن ڕێگەی ئاشتی بگرنەبەر بەڵام گرنگییان بەفەرمانەکانی نەدا و لەجەنگ بەردەوام بوون. ژمارەیەکی زۆر لەدزەکان لەم گۆڕەپانەدا کوژران و عەبدولمەلیك لەکوژرانی ئەوان ئاگادار بوویەوە. دەستی خستە سەر دەست و وتی: هاوار لەم ڕیسواییە، عەرەبەکان لەسەرزەمینی خۆیان ستەمیان لێ دەکرێت. دەستەیەك لەئێرانییەکان کەبەشداری ئەم جەنگەیان نەکرد، بەبیستنی ئەم قسەیە، تووڕە بوون و ئەمەیش بووە هۆی زیاتر خۆش بوونی ئاگری جەنگ. حسەین کوڕی عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان (کەباوکی لەجەنگ دژی تاهیر کوژرابوو) فەرماندەیی ئێرانییەکانی گرتەدەست. دزەکان لەڕەققە کۆبوونەوە و خوراسانییەکانی دیکە

لەرافیقە سوپایان ئامادە کرد. لەم کاتەدا پیاوێك لەخەڵکانی حیمس هەستا و وتی: ئەی حیمسییەکان، هەڵاتن لەڕەنج، ئاسانتر و مەرگ لەریسوایی خۆشترە. ئێوە لەسەرزەمینی خۆتان دوور کەوتوونەتەوە و دوای بێ بەشی، چاوەڕوانی فراوانین و دوای ریسوایی بەدوای پێگە و رێزدا دەگەڕێن. بزانن گرفتارێکی کارێکی بێ هۆ بوون و لەپانتایی مەرگ، خێوەتتان هەڵداوە. مەرگ لەسمێڵ و کڵاوی رەش پۆشەکان (نیشانەی خوراسانییەکان) دەبارێت، ئامادە بن، ئامادە پێش ئەوەی رێگاکان ببەسترێن و زیان بەهەمووان بگات و مەبەستەکەتان پشتگوێ بخرێت و هەڵاتن دژوار بێت.

پیاوێك لەمناڵەکانی کەلب هەستا، سوار وشترەکەی بوو و هەڵات و بەدەم ڕۆشتنەوە دەیوت: دەڕۆم، هەرکەس دەخوازێت، شوێنم کەوێت. ئەو ڕۆشت و هەموو خەڵکانی شام شوێنی کەوتن. دزەکان کاڵا بازرگانییەکانیان کردە خۆراکی ئاگر.

نەسر کوڕی شبس عەقیلی لەگەڵ هاوەڵانی خۆی هێرشیان هێنا و شەڕێکی مەترسیداریان خستەگەڕ. ئێرانییەکان خۆڕاگرییان کرد. کەسیر کوڕی قادرە و باوکی فیل و داود کوڕی عیسای خوراسانی زۆرترین کەسیان لەدزەکان کوشت بەمشێوەیە شکستیان پێهێنان. نەسر کوڕی شبس و عەمرۆ کوڕی عەبدولعەزیزی سولەمی و عەباس کوڕی زوفەری کەلابی فەرماندەیی دزەکانیان لەئەستۆدا بوو. عەبدولمەلیك کوڕی ساڵح لەهەمان ساڵ لەڕەققەماڵئاوایی لەجیهان کرد.

لابردنی ئەمین و بەیعەت لەگەڵ مەئمون و گەڕانەوەی خەلافەت بۆ ئەمین

کاتێك عەبدولمەلیك کوڕی ساڵح مرد، حسەین کوڕی عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان فەرمانی بەسوپاکەدا پیادە و سوار، سوار کەشتییەکان بن. ئەم رووداوە لەمانگی رەجەب/مارس روویدا. کاتێك حسەین کوڕی عەلی گەیشتە بەغداد، فەرماندە و دانیشتووانی بەغداد پێشوازییان لێکرد و چەندین کۆشکیان بۆ ئامادە کرد. ئەو ڕۆشتە ماڵەکەی خۆی. لەنیوە شەودا، ئەمین کەسێکی بەدوایدا نارد. بەنێردراوی ئەمینی وت: نەگۆرانیبێژم، نەقەشمەر، نەچیرۆك بێژ، نەبەکرێگیراوی

ئەوم، نەباجگری ئەو، لەم کاتەی شەو چ کارێکی بەمن هەیە؟ بگەڕێرەوە و بۆ بەیانی خۆم دێمە لای. بەخواستی خوا.

حسەین ئەو شەوەی کردە ڕۆژ، دواتر هاتە سەر پرد. خەڵکان دەوریان گرت و ئەو پێی وتن: ئەی منالّە ئێرانییەکان! فەرمانڕەوایی خوایی بەتەممەڵی و خۆپەسەندی شیاو نییە و پێگەی لەگەڵ خۆبینیدا پەسەند نییە، محەممەد (ئەمین) مەبەستی ئەوەی هەیە دینەکەی ئێوە لەناو ببات و پێگەی ئێوە بەکەسانی دیکە ببەخشێت. ئەوخۆی سەرکردەی زەواقیل (دز و ڕێگرەکانە) سوێند بەخوا ئەگەر ئەم بارودۆخە بەردەوام بێت، ئەنجامەکەی بەرۆکی ئێوە دەگرێت، شوێنەواری بسڕنەوە پێش ئەوەی شوێنەوارتان بسڕێتەوە و ڕێزداری ئەو ریسوا بکەن پێش ئەوەی ڕێزداریتان ریسوا ببێت. سوێند بەخوا کەس هاوکاری ئەو ناکات مەگەر ئەوەی کەسی بەدەورەوە نەمێنێت. خواوەند چاو لەکەس ناپۆشێت، ئەو نەترسی لەگرنگی نەدان بەپەیمانەکەی خۆی هەیە و نە لەشکاندنی سوێندەکەی دەترسێت.

فەرمانی بەخەڵکاندا لەپردەکە بپەڕنەوە. خەڵکان گوزەریان کرد و گەیشتنە دەروازەی خوراسان. سوارەکانی ئەمین هێرشیان کردە سەر حسەین و جەنگێکی قورس دەستپێکرد. سوپاکەی ئەمین شکستیان خوارد و بڵاوەیان لێکرد. حسەین ئەمینی لەڕۆژی یەکشەممەی یانزەی ڕەجەب/٢٨ مارس لەفەرمانڕەوایی لابرد و ڕۆژی دووشەممە بۆ مەئمون بەیعەتی وەرگرت.

بۆ ڕۆژی سێ شەممە، عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا دژی ئەمین ڕاپەڕی و ئەوی لەکۆشکی خولد دەرپەڕاند. دایکی ئەو یانی زوبەیدەیش هەڵات و لەیەك جێگە لەگەڵ کوڕەکەی گرفتار کران. بۆ چوارشەممە سوپاییەکان داوای مانگانەیان لەحسەین کرد. محەممەد کوڕی خالید لای دەروازەی شام وەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا نازانم بۆ حسەین فەرمانڕەوایی ئێمە دەکات و ئێمە بۆ مەبەستەکانی خۆی ناچار دەکات؟ نە لەئێمە گەورەترە، نە لەئێمە خاوەن نەژادترە و نەپێگە و جێگەی لەئێمە بەرزترە. یەکەم کەسم پەیمانەکەم لەگەڵ ئەو دەشکێنم و کردەوەکانی بەقێزەون دادەنێم، هەرکەس لەگەڵ مندایە، شوێنم کەوێت.

ئەسەدی حەربی وتی: ئەی جەنگاوەران! ئەمڕۆ ڕۆژێکی دیکەی بەدواوەیە.

ئێوە لەخەودان و بۆ ماوەیەکی درێژە خەوتوون. ئێوە پشتگوێ خراون و کەسانی دیکە پێش ئێوە کەوتوون. دەستەیەك ئەمینیان لەسەر کار لابردووە کەواتە بیر لەرزگار کردنی ئەو بکەنەوە.

لەم کاتەدا سوارەیەکی بەتەمەن لەرێگەوە گەیشت و وتی: ئەی خەڵکینە، ئایا محەممەد رۆژانەی ئێوەی نەداوە کەدژی ئەوشۆڕشتان کرد؟ وتیان: نە. وتی: ئایا پێگەی فەرماندەکانی ئێوەی بەرز نەنرخاند و کەسی لەسەر کار لابرد؟ وتیان: نە. کەواتە بۆ ئەوتان لەسەر کار لابرد و هاوکاری دوژمنی ئەوتان کرد، سوێند بەخوا هیچ خەڵکێك فەرمانڕەواکەی خۆیان نەکوشت مەگەر ئەوەی خواوەند شمشێری بەسەردا زاڵ کردن. هەستن و فریای فەرمانڕەواکەی خۆتان بکەون و دژی ئەو کەسانە بجەنگن کەخوازیاری لابردنی ئەون. هەمووان تەنانەت ئەو کەسانەی لەناو گەوڕ و تەویلەکاندا ئیشیان دەکرد، لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی جەنگان و سەرئەنجام حسەین کوڕی عەلی زیندانی کرا.

ئەسەدی حەربی هاتە لای ئەمین و ئازادی کرد و لەسەر تەختی خەلافەت داینیشاند. ئەمین دەستەیەکی بینی کەجل وبەرگی جەنگیان لەبەردا نییە. فەرمانیدا کەرەستەکانی جەنگیان بخەنە بەردەست. ئەوان هاواریان دەست پێکرد و دەست درێژییان بۆ سەر سامانەکانی دیکە کرد. حسەینی بەند کراویان بردە لای ئەمین. ئەمین سەرکۆنەی کرد و حسەین داوای بەخشینی کرد. ئەمین ئازادی کرد و فەرمانی پێدا سوپایەك کۆبکاتەوە و بۆ جەنگی مەئمون بەرێکەوێت. ئەمین فەرمانی پێدا رێگەی حیلوان بگرێتەبەر. حسەین لەباب ئەلجسر وەستا و خەڵکان پیرۆزباییان لێکرد. کاتێك خەڵکان بڵاوەیان لێکرد، حسەین پردەکەی بڕی و هەڵات. هەمووان شوێنی کەوتن و لای مزگەوتی کەوسەر لەیەك فەرەسخی بەغداد پێی گەیشتنەوە. پەلاماری یەکیاندا و ئەسپەکەی حسەین خزی و کەوتە خوار. حسەینیان کوشت و سەریان لەجەستە جیا کردەوە.

دەڵێن: ئەمین وەك وەزیر دەستنیشانی کرد و ئەنگوستیلەکەی خۆی پێدا. سوپاییەکان یەك رۆژ دوای کوژرانی حسەین سەر لەنوێ دەستی بەیعەتیان بۆ ئەمین درێژ کرد. لەپانزەی ڕەجەب /٢ ژانویە، پەیکی مەرگ کۆتایی بەژیانی

حسەین هێنا. کاتێك حسەین کوڕی عەلی کوژرا، فەزڵ کوڕی ڕەبیع هەڵات و خۆی شاردەوە.

## تاهیر دەست بەسەر ئەهوازدا دەگرێت

کاتێك تاهیر لەشەلاشان دابەزی، حسەین کوڕی عومەری ڕۆستەمی بۆ ئەهواز ڕەوانە کرد. کاتێك تاهیر حسەین کوڕی عومەری ڕەوانە کرد، سیخوڕەکانی هاتن و ئاگاداریان کردەوە کە محەممەد کوڕی یەزید کوڕی حاتەمی موهەلبی فەرمانداری ئەمین لەئەهواز بەسوپایەکی گەورە بەرەو جوندیشاپور دەڕوات تا لەبەرابەر سوپاکەی تاهیر پارێزگاری لەئەهواز بکات. تاهیر دەستەیك لەهاوەڵانی خۆی وەك: محەممەد کوڕی تالوت، محەممەد کوڕی عەلا، عەباس کوڕی بوخاری بانگ کرد و فەرمانی پێدان بەخێرایی بڕۆن تا یەکەمینی ئەوان بەکۆتایی سوپاکەی رۆستەمی بگات بۆ ئەوەی ئەگەر پێویستی بەهاوکاری بوو، هاوکاری بکەن.

ئەوان ڕۆشتن و گەیشتنە ئەهواز و کەسیان لەرێگەدا نەبینی. محەممەد کوڕی یەزید ئاگادار بوویەوە. لەگەڵ سوپایەك بەرێکەوت و گەیشتە (عەسکەری موکەرەم) ئاو و ئاوەدانییەکانی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشت. تاهیر لەوە ترسا نەکا سوپاکەی ئەهواز زووتر دەست بەکار بێت و لەم رێگەوە زیان بەسوپاکەی بگات. لەبەر ئەمە قورەیش کوڕی سبلی بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە کرد و خۆی بەخێرایی بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و کاتێك لێیان نزیك بوویەوە، مەئمون، عەلی بۆ هاوکاری قورەیش و رۆستەمی ڕەوانە کرد. سوپاییەکان پێشڕەوییان کرد تا لەبەرابەر سوپاکەی محەممەد کوڕی یەزید لەعەسکەر موکەرەم ریزیان بەست.

محەممەد کوڕی یەزید لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد ئایا بۆ جەنگ دەستپێشخەری بکات یانە. بۆچوونیان وابوو بۆ ئەهواز بگەرێنەوە و لەوێ سەنگەر بگرن و داوای هاوکاری لەسوپای بەسرە بکەن و کەسانی خۆیان لەئەزدییەکان بۆ هاوکاری بانگێشت بکەن. محەممەد ئەو کارەی کرد و تاهیر بەدوای ئەودا قورەیش کوڕی سبلی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا پێش ئەوەی لەناو ئەهواز سەنگەر بگرن، جەنگ دەستپێبکات. محەممەد کوڕی یەزید پێش کەوتەوە و رۆژێك دواتر

قوڕەیش گەیشت و شەڕێکی قورسیان هەڵگیرساند. شوێنکەوتەکانی محەممەد هەڵاتبوون. ئەو رووی کردە پاشماوەی سوپاکەی و وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟ هاورێکانمان هەڵاتوون، لەوەی ئەوان ریسوام نەکەن، دڵنیا نیم و هیوادار نیم بگەڕێنەوە. بڕیارمداوە خۆم بڕۆمە گۆڕەپانی جەنگ تا خواستەکانی خواوەند بێتەدی. هەرکەس دەخوازێت بگەڕێتەوە، بگەڕێتەوە. سوێند بەخوا زیاتر حەز بەزیندوو مانەوەی ئێوە دەکەم تا کوژرانتان. وتیان: سوێند بەخوا بەتەنیا جێت ناهێڵین، ئێمەت لەکۆیلایەتی رزگار کرد و دوای ریسوایی پێگەی بەرزت پێ بەخشین و دوای هەژاری بێ نیازت کردین، ئەگەر لێرەدا هاوکاریت نەکەین، دوای تۆ نفرین لەژیان و دنیا بێت.

دەست و پێی چوارپێکانی خۆیان بڕییەوە وبەهەموو هێزەوە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی قوڕەیشی و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. محەممەد کوڕی یەزیدی موهەلبی کوژرا و تاهیر دەستی بەسەر ئەهواز و ناوچەکانی دەوروبەردا گرت و کارگوزارەکانی خۆی رەوانەی عەمان و بەحرەین و یەمامە کرد. محەممەد کوڕی یەزید بریندار ببوو، دەستی قرتابوو و لەئەنجامدا چەند گورزێکی شمشێر و رم، گیانیان لێ سەند. یەکێك لەموهەلبییەکان کە لەم جەنگەدا بریندار ببوو، ئەم هۆنراوەی دەخوێند:

فما لمت نفسی غیر انی لم اطق حراکا و انی کنت بالضرب مثخنا

و لو سلمت کفای قاتلت دونه و ضاربت عنه الطاهری الملعنا

فتی لا بری ان یخذل السیف فی الوغی اذا ادرع الهیجاء فی النقع و اکتنی

واتاکەی: خۆم سەرکۆنە ناکەم (کەهاوکاری محەممەدم نەکردبێت) چوونکە لەسەختی برینەکانم توانای جووڵەم نەمابوو، ئەگەر دوو دەستەکەم بریندار نەدەبوون، شان بەشانی ئەو دەجەنگام و لەگەڵ تاهیری نفرین کراو، رووبەروو دەبوومەوە. ئەو جوامێرێك بوو هەرگیز لەگۆڕەپانی جەنگ شمشێری ریسوا و بێ ئیش نەدەکرد ئەویش کاتێك لەتەپ و تۆزی جەنگ، جل و بەرگی بۆ خۆی دروست دەکرد و نازناوی خۆی دەهێنایە سەرزمان.

کاتێك کوڕی باوکی عویەیینەی موهلبی ڕۆشتە لای تاهیر و وەسفی کرد و

گەیشتە ئەم دێڕە کە:

ما ساء ظنی الا بواحدة          فی الصدر محصورة عن الکلم

واتاکەی: من لەتۆ (ئەی تاهیر) بەد گومان نەبووم مەگەر لەیەك روو ئەویش لەناو سینەی شاراوەیە و بەزمان ناوترێت.

تاهیر بزەیەکی تاڵی گرت و وتی: سوێند بەخوا، بەهەمان ئەندازە بۆ من ناخۆش بوو کەبۆ تۆ، ئەو دەردە منی گرت کەتۆی گرت، منیش ئەوەی روویدا، پەسەندم نەکرد بەڵام مەرگ هیچ رێگە چارەیەکی نییە و رووبەرووی هەر کەسێك دەبێتەوە و پەیوەندییەکان بەناچاری دەبێت بپچڕێن و بۆ بەهێزی خەلافەت و ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ناچار بووین. ئەوانەی لەوێ بوون زانیان مەبەستی شاعیر و تاهیر لەم وتەیە محەممەد کوڕی یەزید کوڕی حاتەمە.

## تاهیر دەست بەسەر واست و ناوچەکانی دیکەدا دەگرێت

تاهیر لەئەهوازەوە بەرەو واست بەرێکەوت. سندی کوڕی یەحیا حەرەشی و هەیسەم کوڕی شوعبە راوێژکاری خوزیمە کوڕی خازم هەردووك کارگوزاری واست بوون. تاهیر بەهەمان شێوە کەبۆ ئەو ناوچەیە پێشڕەوی دەکرد، فەرماندارەکان خۆیان و جبەخانەکانیان دەخستە ژێر فەرمانی ئەو تا گەیشتە واست. سندی و هەیسەم کوڕی شوعبە هەردووك هەڵاتن و تاهیر دەستی بەسەر واستدا گرت. یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی بەرەو کوفە نارد. لەم کاتەدا فەرمانداری کوفە عەباس کوڕی موسای هادی بوو. کاتێك لەکارەکانی تاهیر ئاگادار بوویەوە، ئەمینی لەخەلافەت لابرد و دەستی بەیعەتی بۆ مەئمون درێژ کرد و تاهیری لەم کارەی ئاگادار کردەوە.

سوپاکەی تاهیر گەیشتنە لێوارەکانی نیل (ئەم رووبارە لەدوورگەیەك لەنێوان بەغداد و حیلەدا بووە و جیاوازە لەرووباری نیلی میسر) و بەسەر نێوانی واست و کوفەدا زاڵ بوون. مەنسور کوڕی مەهدی کارگوزاری ئەمین لەبەسرە نامەیەکی بۆ تاهیر نووسی و بەیعەت و فەرمانبەری خۆی بیر هێنایەوە. موتەلیب کوڕی عەبدوڵلە کوڕی مالك، فەرمانداری موسڵ، نامەی بەیعەتی خۆی ڕەوانە کرد

وئەمینی لەسەر کار لابرد. ئەم ڕووداوانە لەمانگی ڕەجەب/ مارس ئەم ساڵە ڕوویاندا. تاهیر ئەوانی وەك فەرمانڕەوای ناوچەکانی خۆیان هێشتەوە و داود کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی هاشمی وەك فەرمانداری مەککە و مەدینە دیاریکرد و یەزید کوڕی جەریر کوڕی یەزید کوڕی خالید کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری بوجلی وەك فەرمانڕەوای یەمەن و حارس کوڕی هوشام و داود کوڕی موسا بۆ گرتنی کۆشکی کوڕی هوبەیرە ڕەوانە کرد و خۆی لەجەرجەرایا مایەوە.

کاتێك ئەمین لەکردەوەی فەرمانداری کوفە ئاگادار بوویەوە و ئەوەی کەئەوی وەك خەلیفە لەسەر کالابردووە و بەیعەتی بۆ مەئمون وەرگرتووە، محەممەد کوڕی سلێمانی قائدی بۆ سەرکوت کردنی ئەو ڕەوانە کرد و محەممەد کوڕی حیمادی بەربەڕی کردە هاوڕێی و فەرمانی پێدان بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەنە سەر حارس کوڕی هوشام و داود لەکۆشك. بەڵام کاتێك حارس لەم کارە ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ داود بەگوزەر لەتەنکاوی ڕووباری سورا هێرشی کردە سەر دوژمن و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد و لەکۆتاییەدا بەغدادییەکان هەڵاتن.

ئەمین، فەزڵ کوڕی موسا کوڕی عیسای هاشمی وەك فەرمانداری کوفە دەستنیشان کرد و لەگەڵ سوپایەك ڕەوانەی ئەو شارەی کرد. تاهیر لەم کارە ئاگادار بوویەوە و محەممەد کوڕی عەلای لەگەڵ سوپایەك بۆ سەر ڕێگەی ئەو نارد. محەممەد کوڕی عەلا لەگوندەکانی ئەعراب ڕووبەڕووی فەزڵ بوویەوە. فەزڵ پەیامی بۆ نارد: من تەنیا گوێرایەڵی فەرمانی فەرماندەی خۆمم و بەس، هاتنی من بۆ جەنگ لەگەڵ تاهیر تەنیا بۆ فریودانی ئەمین بووە. کوڕی عەلا لەوەڵامدا پێی وت: گرنگی بەوتەکەی تۆ نادەم، ئەگەر خوازیاری فەرماندەیی تاهیریت، بگەڕێرەوە چوونکە ئەمە باشترین کارە. فەزڵ گەڕایەوە. محەممەد کوڕی عەلا وتی: وشیار بوون چوونکە لەفرت و فێڵی ئەو دڵنیا نیم.

فەزڵ جارێکی دیکە ڕووی کردە عەلا. گومانی دەکرد کوڕی عەلا ئامادەیی خۆی لەدەستداوە بەڵام بینی ئامادە و وشیارە. بەمشێوەیە شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان هەڵگیرسا و فەزڵ و سوپاکەی بەناچاری هەڵاتن.

## زاڵبوونی تاهیر لەمەداین و دابەزینی ئەو لەسەرسەر

تاهیر رووی کردە مەداین، سوپایەکی گەورەی ئەمین لەم شارەدا ئوردووی لێدابوو. فەرماندەکەیان بەرمەکی سوپاکەی لەناو شاردا سەنگەر پێ گرتبوو و رۆژانە هاوکارییەکانیان بەدەست دەگەیشت. کاتێك تاهیر نزیك کەوتەوە، قورەیش کوڕی شبل و حسەین کوڕی عەلی مەئمونی لەپێشەوە نارد و کاتێك هاوەڵانی بەرمەکی دەنگی تەپڵەکانی سوپاکەی تاهیریان بیست، ئەسپەکانیان زین کرد و سواری بوون و بەرمەکی سوپاکەی خۆی رازاندەوە. بەڵام سوپاکەی بەتەواوی پەرێشان ببوو، هەر دەستەیەکی رێکدەخست، دەستەیەکی دیکە پەرێشان دەبوو. بەرمەکی وتی: خواوەندا لەبێ هاورێیەتی، پەنا بۆ تۆ دەبەم. بەفەرماندەی دواوەی سوپاکەی وت: رێگە بۆ هەڵاتنی خەڵکان بکەرەوە چوونکە ئەمانە هیچ سوودێکمان پێ ناگەیێنن. ئەوانیش کەورەی خۆیان دۆڕاندبوو، بەردەوام هەڵدەهاتن. تاهیر بێ جەنگ دەستی بەسەر مەدایندا گرت و بەسەر ئەو دیارەدا زاڵبوو. دواتر رووی کردە سەرسەر و لەوێ پردێکێ هەڵبەست و خێوەتی هەڵدا.

## وەرگرتنی بەیعەت بۆ مەئمون لەمەککە و مەدینە

لەم ساڵەدا داود کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کارگوزاری ئەمین لەمەککە ئەوی لەخەلافەت لابرد و دەستی بەیعەتی بۆ مەئمون درێژ کرد.

هۆکاری بۆ ئەم کارە ئەوە بوو هەواڵی جەنگەکانی نێوان ئەمین و مەئمون و سەرکەوتنەکانی تاهیری پێگەیشت. ئەمین نامەیەکی بۆداود کوڕی عیسا نووسی و فەرمانی پێدا مەئمون لەخەلافەت لاببات و فەرمانی پێدا دوو پەیمان نامەی جێگری خەلافەت لەکەعبە لێ بکاتەوە و رەوانەی بەغدادی بکات. کاتێك ئەم کارەی کرد، داود سەرکردەی خەڵکانی بۆ ئەم دوو پەیمان نامەیە کردە شایەت و پێی وتن: ئێوە لەو پەیمانەی رەشید لەماڵی خوا بۆ دوو کوڕەکەی وەرگرت، ئاگادارن.

لەسەر بنەمای ئەم پەیمانە ئێمە دەبێت هاورێی ستەملێکراو دژی ستەمکار و یاری فریودراو و دژی فریودەر بین. بینیمان و بینیتان محەممەد ستەمی لەدوو براکەی خۆی کرد و بۆ کورەکەی کەهێشتا شیرەخۆرەیە، بەیعەتی وەرگرت و دوو پەیمان نامەکەی لەکەعبە کردەوە و هاوشێوەی ستەمکاران سووتاندی. بەباشی دەزانم ئەمین لەسەر کار لاببەین و دەستی بەیعەت بۆ مەئمون درێژ بکەین چوونکە ستەمی لێکراوە و مافەکانی ئەوە پێشێل کراوە.

ئەوان بەم پێشنیارە رازی بوون. جارچی لەسەرەو خواری مەککە جارِیدا و خەڵکان کۆبوونەوە. داوود لەناو خەڵکان فەرمانی خوێندەوە و محەممەد ئەمینی لەسەر کار لابرد و بۆ مەئمون بەیعەتی وەرگرت. هەروەها فەرمانێکی بۆسلێمانی کورِی نووسی کەفەرمانداری مەدینە بوو. فەرمانی پێدا کارەکەی ئەو لەمەدینە ئەنجام بدات. سلێمانیش ئەمینی لەسەر کار لابرد و بەیعەتی بۆ مەئمون وەرگرت.،

کاتێك هەواڵی بەیعەتی سلێمان بەداود گەیشت، ئەو لەبەسرەوە رێگەی مەککەی بەرەو فارس و دواتر کرمان برِی تا لەمەرو گەیشتە لای مەئمون و ئەوی لەچەندایەتی و چۆنایەتی بارودۆخ ئاگادار کردەوە. مەئمون لەم پێشهاتە شادمان و بەیعەتی خەڵکانی مەککە و مەدینەی بەپیرۆز لەقەڵەمدا.

ئەم بەیعەتە لەمانگی رەجەبی ساڵی ٨١١/١٩٦ زایینی وەرگیرا. رەشید فەرمانداری مەککە و مەدینەی پەیوەست بەشاری عەکی بەداود سپارد و پێنسەد هەزار درهەمی پێشکەش کرد و برازاکەی، عەباس کورِی موسا کورِی عیسا کورِی موسای لەگەڵ ئەودا رەوانە کرد و وەك سەرپەرەستی ئەنجامدانی رێ و رەسمی حەج دەستنیشانی کرد. ئەوان هاتن تا لەبەغداد پەیوەستی تاهیر بوون. تاهیر رێزی لێگرتن و لەخۆی نزیکی کردنەوە و یەزید کورِی جەریر کورِی یەزید کورِی خالید کورِی عەبدوڵلای قەسری بوجلی وەك کارگوزاری یەمەن لەگەڵ ئەواندا رەوانە کرد و سوپایەکی گەورەی خستە ژێر دەستی ئەوان.

کاتێك یەزید گەیشتە یەمەن، پێشنیاری لابردنی ئەمین و خەلافەتی مەئمونی بەخەڵکان کرد و مژدەی دادپەروەری و چاکەکاری پێدان و لەکردەوەکانی مەئمون ئاگاداری کردنەوە. خەڵکانی یەمەن بەداواکەی رازی بوون و محەممەد ئەمینیان

لەسەر کار لابرد و بەیعەتیان بەمەئموندا.

یەزید ئەم هەواڵەی بۆ تاهیر و مەئمون نووسی و باشترین کردەوەی گرتەبەر و دادپەروەری کردە پیشە.

## کردەوەکانی ئەمین

لەم ساڵەدا ئەمین لەدوو مانگی رەجەب و شەعبان/مارس و ئاوریل نزیك بەچوارسەد ئالآی بۆ چوارسەد فەرماندە بەست وئەوانی لەژێر ئالآی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عیسا کوڕی نەهیك بۆ جەنگی هەرسیمە کوڕی ئەعیەن ڕەوانە کرد. ئەوان بەرەو گۆڕەپانی جەنگ بەرێکەوتن و لەنزیك نەهرەوان لەمانگی رەمەزان/ مەی، رووبەرووی سوپای دوژمن بوونەوە و تەنیا رێگەیان هەڵآتن بوو. لەم جەنگەدا عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عیسا گرفتار و هەرسیمە ئەوی بۆ لای مەئمون نارد. دواتر هەرسیمە بەرێکەوت و لەنەهرەوان ئوردووی لێدا.

شۆڕشی سوپا دژی تاهیر و ئەمین و هاتنی ئەمین بۆ بەغداد

تاهیر لەسەرسەر مایەوە و خۆی بۆ جەنگ دژی ئەمین ئامادە کرد. سوپایەك لەلایەن ئەمینەوە بۆ جەنگی ئەو نەدەهات مەگەر ئەوەی شکستی دەخوارد. ئەمین سامانێکی زۆری بەسوپاکەی خۆی دەدا. ئەم کارە بۆسوپاییەکانی تاهیر ناخۆش بوو و پێنج هەزارکەس لەوان پەیوەستی سوپاکەی ئەمین بوون. ئەمین شادمان و مژدەی پێدان و چاکەی لەگەڵ کردن و سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا بلآو کردەوە و فەرمانی پێدان (غالیە) بۆنێکی خۆش لەریشیان بدەن. لەبەر ئەمە ئەوانیان بەسەرکردەکانی غالیە ناوبرد و پێگەیەکی بەرزتری بەدەستەیەك لەجەنگاوەران بەخشی و ئەوانی بۆ دەسکەرە ئەلمولك و نەهرەوان ڕەوانە کرد بەلآم شەڕێکی ئەوتۆ روویندا. ئەمین دەستەیەك لەفەرماندەکانی بەغدادی هەڵبژارد و ئەوانی بۆ باسریە و کەوسەرییە نارد و لەناو سوپاکەی تاهیر چەندین سیخوڕی بلآو کردەوە و بەنهێنی تەماحی خستە بەردەم فەرماندەکانی تاهیر وهانیدان دژی تاهیر شۆڕش بکەن. زۆر لەوان داوای ئەمانیان لەئەمین کرد و پەیوەستی سوپاکەی بوون و دواتر

بۆ جەنگ دژی تاهیر ڕێگەی سەرسەرپیان گرتەبەر. تاهیر سوپاکەی خۆی کردە چەندین دەستە و کەسانێکی راسپارد تا سوپاییەکان هان بدەن و مژدەی سەرکەوتنیان پێ ببەخشن. دواتر خۆی بەرێکەوت.

هەر دوو سوپا تا ماوەیەك لەرۆژ جەنگان و لەکۆتاییەدا سوپاکەی ئەمین شکستیان خوارد و سوپاکەی تاهیر کەل و پەل و تالأنی زۆریان دەستکەوت.

ئەمین لەم ئەنجامی ئەم جەنگە ئاگادار بوویەوە و سامانێکی زۆری لەناو سەربازەکاندا دابەش کرد و هێزەکانی دەوروبەری شاری کۆکردەوە و نیشانی فەرماندەیی بەدەستەیەکیان بەخشی و پارەیەکی زۆری پێدان و بەهەرکام لەفەرماندەکان بڕێکی زۆر غالیەی بەخشی و لەناو سوپاییەکان و شەڕکەرانی ئەم فەرماندانە هیچی دابەش نەکرد. تاهیر لەم کارە ئاگادار بوویەوە و نێردراوێکی بۆ لای ئەم دەستەیە نارد و مژدەی پێدان، دڵنەوایی کردن و شتە گەورەکانی لەبەرچاوی ئەوان کەم بەها و شتە ناگرینگەکانی لەبەر چاوی ئەواندا گەورە کرد. لەمانگی زیحەججە/ ئوت سوپاکەی دژی ئەمین هاندا. بارودۆخ بۆ ئەمین دژوار بوو. راوێژکارانی ئەمین پێشنیاریان کرد چاکە لەگەڵ ئەم دەستەیە بکات و دڵنەواییان بداتەوە بەلأم ئەو کارەی نەکرد و فەرمانی بەدەستەیەك لەسەربازەکاندا کەتازە پەیوەستی ببوون و لێیان دڵنیا بوو ئەو دەستەیە سەرکوت بکەن. بەمشێوەیە شەڕ لەنێوان دوو دەستەی سوپاکەی ئەمین هەڵگیرسا. تاهیر پەیك و پەیامی بۆ دەستەی سەرکوت کراو ڕەوانە کرد و بارمتەکانی ئەم دەستەی بەو مەرجەی ملکەچی فەرمانەکانی ئەوبن، ئازاد کرد.

تاهیر درێژەی بەرێگەدا و لەمانگی زیحەججە/ئوت گەیشتە باب ئەلئەنبار، دەستیان بەسەر بوستاندا گرت. لەبوستان ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپاکەی ئەمین داوای ئەمانیان کرد و پەیوەستی سوپاکەی تاهیر بوون. تاهیر بەخشینەکانی بۆ فەرماندەکان و منداڵەکانی ئەوان زیاد کرد. زیندانییەکان لەناو زیندانەوە تونێلێکیان هەڵکەند و هەڵاتن و بەمشێوەیە بارودۆخی بەغداد شڵەژا و خراپەکاران دژی چاکەکاران راپەڕین بەلأم سوپاکەی تاهیر هیچ گۆڕانێکی لەژیانی خەڵکاندا دروست نەکرد و تەنیا ڕێگەی لەخراپەکاران و نەزانەکانی ئوردووی خۆی دەگرت

تا ئەو جێگەی هەردوو لای شەڕکەر بەتەواوی بێزار بوون و شارەکەیان بوو بەوێرانە.

عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و پێشنیاری بەخەڵکان دەکرد بەیعەت لەگەڵ مەئمون بکەن. ئەمە یەکەم حەج بوو بانگەواز بۆ خەلافەتی مەئمون دەکرا.

## جەنگی خەڵکانی ئەفریقییە لەگەڵ خەڵکانی تەرابلوس

لەم ساڵەدا باوکی عیسام و شوێنکەوتەکانی دژی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە. ئیبراهیم ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، عەبدوالله کوڕی کردە فەرمانڕەوایی تەرابلوسی ڕۆژهەڵات بەڵام کاتێك هەنگاوی خستە ئەو سەرزەمینە، سوپا دژی ئەو ڕاپەڕی و دەوری ماڵەکەیان گرت و لەسەر بنەمای بەجێهێشتنی ئەو سەرزەمینە پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ واژۆ کرد. عەبدوالله تەرابلوسی بەجێهێشت بەڵام هێشتا زۆر دوور نەکەوتبوویەوە ژمارەیەکی زۆری خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا دابەش کرد و بەربەرییەکان پەیوەستی بوون. عەبدوالله بۆ هەر سوارەیەك ڕۆژانە چوار درهەم وبۆ هەر پیادەیەك ڕۆژانە دوو درهەمی دیاری کرد. بەمشێوەیە ژمارەی سوپاکەی فراوان بوو. لەگەڵ ئەوان ڕێگەی تەرابلوسی گرتەبەر و سوپاکەی تەرابلوس شکستی خوارد و عەبدوالله ڕۆشتە ناو ئەو سەرزەمینە و ئەمانی پێ بەخشین و لەوێ مایەوە. بەڵام دواتر باوکی لەکار دووری خستەوە و سوفیان کوڕی مەزای لەجێگەی ئەو دانیشاند. هۆزی هەواری تەرابلوس دژی سوفیان ڕاپەڕین و جەنگیان لەگەڵ سوپاکەی کرد. سوپای سوفیان بۆ ناو شارەکە هەڵاتن و خەڵکانی هوارە شوێنیان کەوتن. سوپای هەڵاتوو پاشەکشێی دەکرد و هاتنە ناو شارەکە. خەڵکانی هوازە دیواری شارەکەیان وێران کرد.

ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب لەم جەنگە ئاگادار بوویەوە و کوڕەکەی خۆی باوکی

عەباس عەبدوڵڵەی لەگەڵ سیانزە هەزار سوار بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. هێزەکانی ئەو لەگەڵ بەربەرەکان ڕووبەڕوو بوونەوە. بەربەرەکان هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژرا. عەبدوڵڵە هاتە ناو شارەکە و سەر لەنوێ دیواری شارەکەی دروست کردەوە.

عەبدولوەهاب کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی ڕۆستەم لەشکستی بەربەرەکان ئاگادار بوویەوە. دەستەیەکی لەبەربەرەکان کۆکردەوە و هانیدان و ئەوانی بۆ هاوکاری بەربەرە شکست خواردووەکان ڕەوانە کرد. ژمارەیان فراوان بوو. ئەوان گەیشتنە تەرابلوس و گەمارۆیان خستە سەر شارەکە. باوکی عەباس عەبدوڵڵە کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، دەروازەی زەناتەی بەست و لەدەروازەی هەوارەوە جەنگی دەستپێکرد. لەجەنگ بەردەوام بوو تا ئەوەی هەواڵی مەرگی باوکی بیست. ئیبراهیم، عەبدوڵڵەی وەك جێگری خۆی دیاریکردبوو. براکەی عەبدوڵڵە، زیاد الله کوڕی ئیبراهیم، پەیمانی جێگری براکەی بۆ سوپاییەکان نارد و ئەو نامەیە بۆ عەبدوڵڵەی برای ڕەوانە کرا. بەربەرەکان نامە و نامەبەریان گرت وئەویان بردە لای عەبدولوەهاب کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی ڕۆستەم. فەرمانیدا تا کوژرانی باوکی عەبدوڵڵە بەدەنگی بەرز بەخەڵکان بڵێن. عەبدولڕەحمان کوڕی ڕۆستەم بەو مەرجە لەگەڵ عەبدوڵڵە ئاشتی کرد تەرابلوس و دەریا لەژێر دەستی عەبدوڵڵەدا بێت و ناوچەکانی دیکە بۆ عەبدولڕەحمان کوڕی ڕۆستەم بێت. دواتر عەبدوڵڵە ڕێگەی قەیرەوانی گرتەبەر و خەڵکان پێشوازییان لێکرد. ئەو لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. لەرۆژگاری ئەو ئارامی و ئاسایش باڵی بەسەر ئەو دیارەدا کێشا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و حەوتی کۆچی ( ٨١٢ زایینی )

### گەمارۆی بەغداد

لەم ساڵەدا تاهیر، هەرسیمە و زوهەیر کوڕی موسەییب، گەمارۆیان خستە سەر ئەمین لەبەغداد. زوهەیر کوڕی موسەییبی زەببی لەبورقەی کلوازی دابەزی و قەڵاکوت و عارەبانە جەنگییەکانی جێگیر کرد و خەندەکی لێدا. ئەو جارنەجار کە سوپاکەی تاهیر سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ بەغدادییەکان بوون، لەخەندەکەکەی دەهاتەدەر و عارەبانە جەنگییەکانی دەخستە کار و باجی لەبازرگانان وەردەگرت. خەڵکان سکاڵایان بۆ لای تاهیر بەرز کردەوە. هەرسیمە لەبەین نەهرەین دابەزی و خەندەکی بەدەوری خۆیدا هەڵکەند. عوبەیدالله کوڕی وەزاح لەشەماسییە دابەزی و تاهیر ڕۆشتە باخێك لەباب ئەلئەنبار. کاتێك تاهیر گەیشتە باب ئەلئەنبار، ئەمین پەرێشان و هەموو سامانەکەی لەنێوان شەڕکەراندا بڵاو کردەوە و فەرمانی فرۆشتنی هەموو کاڵاکانی گەنجینەی دەرکرد. دەفرە سیمین و زێڕینەکانی شکاند و سکەی لێدا و لەناو سوپاییەکاندا بەخشییەوە. فەرمانیدا گەڕەکی حەربییە بسوتێنن. بەرادەیەك نەوت و ئاگری لەوێ بەکار برد کەژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی کوژران.

سەعید کوڕی مالك کوڕی قادم داوای ئەمانی لەتاهیر کرد. تاهیر ئەمانی پێ بەخشی و بازار و کەنارەکانی ڕووبارەی دیجلە و دەوروبەری خستە ژێر فەرمانی ئەو. فەرمانی پێدا خەندەك هەڵکەنێت و دیوار بۆ ئەو ڕێگانە دروست بکات کەدەستی بەسەردا دەگرێت. بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە سامانێکی زۆری خستە بەر دەست. وێرانی و خاپوور بوونی بەغداد زیادی کرد و ماڵەکان چۆڵ کران. ئەمین، عەلی ئەفراە مەردی وەك فەرمادەی کۆشکی ساڵح و کۆشکی سلێمان کوڕی مەنسور لەکەنار دیجلە دەستنیشان کرد. عەلی ئەفراە مەرد ئاگری لەگەڕەك و کۆڵانەکان بەردا، ماڵی خەڵکی سوتاند و وێرانی کرد و بەقەڵا کوتەکان سەرقاڵی خاپور کردن بوو تاهیریش بەهەمان شێوە. تاهیر پێشنیاری بەخەڵکانی دەوروبەری

بەغداد لەرێگەی ئەنبار و دەروازەی کوفە و ناوچەکانی دیکە کرد گوێرایەڵی فەرمانەکانی بن. خەڵکان رازی بوون. خەڵکی هەر گەڕەکێك کەملکەچی خۆیان بۆ تاهیر نیشاندا، خەندەکیان بەدەوری گەڕەکەکەیان هەڵکەند. هەرکەس بەپێشنیارەکەی تاهیر رازی نەبوو، سکی هەڵدڕی و ماڵەکەی سوتاند. بەمشێوەیە بەغداد کاول و هەوری ترس سێبەری خستە سەر بەغداد. حسەین خولەیع لەمبارەوە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أتسرع الرحلة اغذاذا | عن جانبي بغداد ام ماذا؟ |
| اما ترى الفتنة قد الفت | الى اولى الفتنة شذاذا |
| و انتقضت بغداد عمرانها | عن رای لا ذاك و لا هذا |
| هدما و حرقا قد اباد اهلها | عقوبة لاذت بمن لاذا |
| ما احسن الحالات ان لم تعد | بغداذ فى القلة بغداذا |

واتاکەی: ئایا کۆچ کردن لەدوو لای بەغداد دەستی پێکردووە یا چ رووداوێك روویداوە؟ ئایا نابینیت ئاژاواچییەك چۆن ئاژاوەچییەکانی هان داوە و ئەوانی بلاّو کردۆتەوە. ئاوەدانی بەغداد لەناوچووە بێ ئەوەی شوێنکەوتەی بۆچوونی ئەم یا ئەو بێت. وێرانی و ئاگرکەوتنەوەی خەڵکان ئەوێی خاپور کردووە و ئەمە سزایەکە بەرۆکی ئەوانی گرتووە. چەندە باش دەبوو بەغداد بەم کەم و کوڕی و وێرانییەی پێی براوە، چیتر نەدەبووە بەغداد.

تاهیر ئەو گەڕەکانی ناسازگارییان دەکرد و هەروەها شاری مەنسور (بەغدادی کۆن) و بازارەکانی کەرخ و خولدی بە(دار النکث) (ماڵی پەیمان شکێنی) ناوبرد. ئەو دەستی بەسەر زەوی کەسانێك لەمناڵەکانی هاشم و سەرکردەکانی و کەسانی دیکەدا گرت کەپەیوەستی نەبیوون، سامانی ئەوانی زەوت کرد و بەمشێوەیە ریسوا بوون و شکستیان خوارد. سوپاییەکانیش چیتر توانای جەنگیان نەما و خراپەکاران و پێ پەتییەکان و هەلاّتووانی زیندانەکان و دز و گیرفان بڕەکان و دەستفرۆشەکان، سامانی خەڵکیان تالاّن کرد.

تاهیر بێ ئەوەی لاوازی لەخۆی نیشان بدات، دوژمنانی سەرکوت دەکرد. عەلی ئەفراە مەرد فەرماندەی کۆشکی ساڵح داوای ئەمانی کرد. تاهیر ئەمانی پێ

بەخشی و سوپایەکی گەورەی ڕەوانە کرد. عەلی لەجومادی الاخرەی ئەم ساڵە/ فەوریە، ئەوەی لەژێر دەستیدا بوو، تەسلیمی تاهیری کرد. محەممەد کوڕی عیسا فەرماندەی پاسەوانەکان کە بۆ هاوکاری ئەمین هەوڵی دەدا، چۆکی دادا. کاتێك ئەم دووانە ملکەچی فەرمانەکانی تاهیر بوون، ئەمین لەلەناوچوونی خۆی دڵنیا بوو. پیێ پەتی و دەستفرۆش و سەربازەکانی دیکە هێرشیان کردە سەر کۆشکی ساڵح و شەڕێکی قورس دەستییێکرد. ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی تاهیر کوژران و دەستەیەك لەفەرماندەکانیشیان لەناو چوون. پێشتر و دوای ئەم شەڕە، هیچ جەنگێك بەم ئەندازەیە زیانی لەسوپاکەی تاهیر نەدا.

تاهیر بۆ سەرکردەکانی هاشمی و کەسانی دیکە نامەی نووسی و ئەمانی پیێ بەخشین و پێشنیاری بەیعەتی مەئمونی پێکردن. دەستەیەك لەوان وەك عەبدوالله کوڕی حومەید کوڕی قەحتەبە و براکانی، منالەکانی حەسەن کوڕی قەحتەبە، یەحیا کوڕی عەلی کوڕی ماهان و محەممەد کوڕی باوکی عەباسی تائی بەپێشنیارەکەی رازی بوون. دەستەیەکی دیکەیش نامەیان بۆ تاهیر نووسی.

ئەمین دوای کارەساتی کۆشکی ساڵح، سەرقاڵی خۆشی و رابواردن بوویەوە (لەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە). کاروبارەکانی بە محەممەد کوڕی عیسا کوڕی نەهیك و هەرش سپارد. شۆڕشگێران و خراپەکارارانی هاوڕێی ئەوان بەئەندازەیەك لەم و لەو دزییان کرد کەپێشتر وێنەی نەبینراوە.

لێرەدا، هەرکەس هێزی بوو لەبەغداد ڕۆشتەدەر. هەرکات کەسێك مەبەستی ڕۆشتنەدەرەوەی دەکرد، ئەمانی بۆ خۆی و کەسەکانی دەویست. هەرکام لەوان نیشانەی ئەم ئایە بوو: ((لەنێوان ئەوان دیوارێك لیێ دەدرێت کەدەروازەیەکی هەیە: لەناوەوەی لێخۆشبوونە و ڕۆشتنەدەر لێی، سزای بەدواوە دێت.)) دەستەیەکیش بەبیانوی ڕۆشتن بۆ ماڵی خوا، بەغدادیان بەجێهێشت. شاعیرێك سەبارەت بەوان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| اظهروا الحج و ما ینوونه | بل من الهرش یریدون الهرب |
| کم اناس اصبحوا فی غبطة | و کل الهرش علیهم بالعطب |

واتاکەی: وا نیشانی خەڵکان دەدەن کەدەڕۆنە ماڵی خوا، بەڵام ئەوە

مەبەستەکەیان نییە بەڵکو خوازیاری هەڵاتن لەهەڕشن. زۆر لەخەڵکان حەسرەتی ئەو کەسانە دەخۆن کەبەدەستی هەڕش گیانی لێ سەندراوە.

یەکێك لەگەنجەکانی بەغداد وتی:

بكيت دما على بغداذ لما فقدت غضارة العيش الانيق

تبدلنا هموما من سرور و من سعة تبدلنا بضيق

اصابتنا من الحساد عين فأفنت اهلها بالمنجنيق

فقوم احرقوا بالنار قسرا و نائحة تنوح على غريق

و صائحة تنادى: و اصباحا و باكية لفقدان الشفيق

تفر من الحريق الى انتهاب مضمخة المجاسد بالخلوق

و سالبة الغزالة مقلتيها مضاحكها كلالاء البروق

حيارى هكذا و مفكرات عليهن القلائد فى الحلوق

ينادين الشفيق و لا شفيق وقد فقد الشقيق من الشقيق

و مغترب قريب الدار ملقى بلا راس بقارعة الطريق

توسط من قتالهم جميعا فما يدرون من اى الفريق

فما ولد يقيم على ابيه و قد فر الصديق عن الصديق

و مهما أنس من شىء تولى فانى ذاكر دار الرقيق

واتاکەی: بۆ بەغداد خوێن گریام کاتێك سەرسەوزی ژیانی لەدەستدا. شادی ئێمە رەنگی پەژارەی لێ نیشت و لەفراوانی گرفتاری تەنگی بووین. حەسرەت خۆران ژەهری خۆیان بەئێمە ڕشت و خەڵکی بەغدادیان بەقەلاکوت، سەرکوت کرد. دەستەیەکیش بەزۆر بوونە خۆراکی ئاگر و ژنە پرسەگێرەکان بۆ خنکاوەکانی خۆیان دەگرین. ژنێك لەبەرەبەیان دەنگی ناڵە بەرز دەکاتەوە و ژنێك بۆ لەدەست دانی خۆشەویستی فرمێسك لەچاو دەبارێنێت. زۆر ژنی جوان و خەرامان بەجل و بەرگی دڕاو و خوێناوی خۆی نیشان دەدات. ئەگەری هەیە ژنێك لەترسی ئاگر پەنا بۆ تالانی ببات و باوکی بەرەو ئاگر هەڵدێت (لەبەر هەژاری) کچێکی جوان کەدەتوت چاوی کارمامزی فڕاندووە و ددانەکانی هاوشێوەی کارەبا دەبریسکایەوە و ملوانکەی لەملدایە، یا سەرگەردانە یا ئەندێشە دەکات، ئەو

بانگی خۆشەویستەکانی خۆی دەکرد بەڵام چ سوود کەخۆشەویستەکانی خۆی لەدەست داوە. دەستەیەك سەرقاڵی جەنگن وکەس نازانێت کێ لەگەڵ کێ دەجەنگێت و کێ بەرۆکی کێی گرتووە. منداڵ باوکی خۆی ناناسێت و هاوڕێ لەهاوڕێ رادەکات. هەر پێشهاتێکی رابردوو لەبیر بکەم، هەرگیز ماڵی کۆیلە فرۆشەکان لەبیر ناکەم.

جەرەمی قەسیدەیەکی درێژی سەد و بیست دێری هۆنیوەتەوە کەئاماژە بەهەموو رووداوەکانی جەنگی بەغداد دەکات بەڵام لەبەر زۆری ئەم قەسیدەیە، لەئاماژەدان پێی چاوم پۆشی.

دەڵێن: سەرکردەیەك لەخەڵکانی خوراسان و لەهاوەڵانی تاهیر (یەکێك لەبوێرەکان) رۆژێك رووی کردە گۆڕەپانی جەنگ. دەستەیەکی پێ پەتی بینی بێ ئەوەی کەرەستەی جەنگیان پێ بێت. بەشەرکەرانی هاوڕێی وت: کەس دژی ئێمە ناجەنگێت مەگەر ئەمانە کە بەسووکیان دەزانین. بەوەڵامدا پێیان وت: ئەمانە بەڵان. سەرکردە وتی: هاوار لەئێوە، بەم هەموو کەرەستەی جەنگەی پێتانە، لەدەست ئەمانە ڕادەکەن. ئەوانە کەی دەتوانن بێ قەڵغان و کەرەستەی جەنگ رووبەرووی ئێوە ببنەوە.

ئەمەی وت و هێرشی کردە سەر یەك لەوان. چەرمێکی ڕەشی قیراوی هاوشێوەی قەڵخان بەدەستەوە گرتبوو و لەژێر باڵی قۆچەقانییەکی (بەرد هاوێژ) حەشاردابوو. سەرکردە هەر تیرێکی بۆ دەهاویشت بەر قەڵغانەکەی دەکەوت و لەبەردەمیا دەکەوتە خوار. ئەو تیرەکانی هەڵدەگرتەوە و هەڵدەهات و لەرێگەدا هاواری دەکرد: یەك پشیز، یەك پشیز. یانی پشیزێکی بەدەست هێناوە کەبەهای یەك تیرە. ئەو دووانە بەمشێوەیە لەجەنگ بەردەوام بوون و تیری سەرکردەی خوراسانی تەواو بوو. ئەوسا ئەو پێ پەتییە بەقۆچەقانییەکەی دەستی، هێرشی کردە سەر سەرکردە. بەردێکی خستە ناو قۆچەقانییەکەی و هاویشتی. چاوی ئەوی نیشانە گرت و بەهاویشتنی بەردێکی دیکە، ئەوی خستە سەر زەوی. سەرکردەی خوراسانی دۆڕاو، لەکاتێکدا هەڵدەهات، هاواری دەکرد: ئەمانە بەشەر نین.

کاتێك تاهیر لەم شەڕە ئاگادار بوویەوە، قاقا پێکەنی. لەبەر ئەوەی تاهیر لەم شێوە جەنگە زیانی بینیبوو و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی لەکۆشکی ساڵح کوژران، فەرمانیدا ماڵی دوژمنان لەنێوان دیجلە و شوێنی کۆیلە فرۆشەکان و دەروازەی شام و کوفە تا گەڕەکی سەرات و رەبس حومەید و رووباری کەرخایا بسووتێنن و خاپوری بکەن. کاتێك تاهیرییەکان ماڵێکیان وێران دەکرد، کەسەکانی ئەمین دەرگا و سەقفی ماڵەکەیان هەڵدەگرت و ئەمە بەلای خاوەن ماڵەوە نەشیاو بۆ بەخشین بوو. شاعیرێك لەناو ئەوان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| لنا کل یوم ثلمة لا نسدها | یزیدن فیما یطلبون و ننقض |
| اذا هدوما دارا اخذنا سقوفها | و نحن لاخری غیرها نتربص |
| فان حرصوا یوما علی الشر جهدهم | فغوغاؤنا منهمن علی الشر احرص |
| فقد ضیقوا من ارضنا کل واسع | و صار لهم اهل بها و تعرص |
| یثیرون بالبطل القنیص، فان بدا | لهم وجه ضید من قریب تقنصوا |
| لقد افسدوا شرق البلاد و غربها | علینا فما ندری الی این نشخص |
| اذا حضروا قالوا بما یعرفونه | و ان لم یروا شیئا قبیحا تخرصوا |
| و ما قتل الابطال مثل مجرب | رسول المنایا لیله یتلصص |

واتاکەی: هەر رۆژ کەلێنێك لەئێمەدا دروست دەبێت و توانای گرتنیمان نییە. ئەوان بۆ مەبەستەکەی خۆیان زێدەرۆیی دەکەن و ئێمە کەم بوونەوە. هەرکات ماڵێك وێران دەکەن، ئێمە سەقفەکەی هەڵدەگرین و دووبارە چاوەڕوانی تالآنییەکی دیکەین. ئەگەر ئەوان (تاهیرییەکان) لەسەر ئاژاوە پێداگری بکەن، خراپەکارانی ئێمە بۆ ئاژاوە لەوان تەماحکارترن. هەموو پانتاییەکانی سەرزەمینەکەمانیان لێ تەسك کردووین و لەهەر شوێنێکی ماڵێکیان بۆ خۆیان دروست کردووە. تاهیرییەکان بەلێدانی تەپڵ نێچیر دەبزوێنن و ئەگەر لەنزیکی نێچیرێکیان بینی، ڕاوی دەکەن. ئەوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای سەرزەمینەکەی ئێمەیان وێران کرد و نازانین روو لەکوێ بکەین. ئەگەر ئامادە بن، ئەوەی دەیزانن، دەیهێننە سەرزمان و ئەگەر کارێکی قێزەون نەبینن، بوخاتن هەڵدەبەستن. هەرگیز نوێنەری شەو کەبەدزییەوە دێت، هاوشێوەی خاوەن ئەزمونی ئەوان پاڵەوانەکان لەخاك و خوێندا

ناگەوزێنێت.

کاتێك تاهیر بینی لەگەڵ ئەمەیشدا ملکەچی فەرمانەکانی نابن، رێگەی بازرگانی کردن لەگەڵ ئەوانی گرت و نەیهێشت خواردەمەنییان پێ بگات و گرفتاری کردن. کەشتییەکانی بۆ فورات گەڕاندەوە کەباریان بۆ ئەو ناوچەیە دەبرد. ئەم کارە بۆ ئەوان دژوار بوو. نرخی شتومەك بەرز بوویەوە. ئەمین فەرمانیدا سامانی خەڵکان بگرن و بیفرۆشن و دەستەیەك لەکەسەکانی خۆی بۆ ئەم کارە راسپارد. ئەم دەستەیە شەو و رۆژ هێرشیان دەکردە سەر ماڵی ئەو کەسانەی خورادەمەنییان پاشەکەوت کردبوو. بەمشێوەیە بەدگومانی یەخەی دەستەیەکی دیکەی گرت.

شەڕێکی دیکە لەدەرب ئەلحجارە روویدا و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی تاهیر کوژران. شەڕێکی دیکە لەشەماسییە روویدا و تیایدا حاتەم کوڕی سەقەر لەگەڵ دەستەیەك لەخراپەکاران و ئاژاوەچییەکان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەر عوبەیدالله کوڕی وەزاح. عوبەیدالله کەئاگادار نەبوو، هەڵات و حاتەم دەستی بەسەر شەماسییەدا گرت. هەرسیمە بۆ هاوکاری عوبەیدالله هاتە گۆڕەپانی جەنگ و بەدەستی یەکێك لەهاوەڵانی ئەمین دیل کرا. ئەم سەربازە نەیدەزانی کێی ئەسیر کردووە. یەکێك لەهاوەڵانی هەرسیمە هێرشی کردە سەریان و هەرسیمەی رزگار کرد بەڵام لەکۆتاییدا هاوەڵانی هەرسیمە هەڵاتن و بۆ ماوەی دوو رۆژ دەستیان لەجەنگ هەڵگرت.

کاتێك تاهیر لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە، لەسەرەوەی شەماسییە پردێکی هەڵبەست و هاوەڵانی خۆی بۆ جەنگی دوژمن رەوانە کرد. ئاگری شەڕێکی ماڵوێرانکەر بڵێسەی سەند تا ئەوەی سوپاکەی ئەمین شکستی خوارد و سوپاکەی عوبەیدالله کوڕی وەزاح بۆ شوێنەکەی خۆیان گەڕانەوە و ماڵەکانی ئەمینیان لەخەیزەرانییە سوتاند. ئەمین بۆ دروست کردنی ئەم ماڵانە بیست هەزار درهەمی خەرج کردبوو. لەم جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لەخراپەکاران کوژران و بەمشێوەیە هێزی ئەمین کەمی کرد و لە لەناوچوونی خۆی دڵنیا بوو. عەبدوالله کوڕی خازم کوڕی خوزیمە لەترسی ئەمین بۆ مەداین هەڵات. پێشتر خراپەکارانی

بەغداد هێرشیان کردبووە سەر. ئەو لەمەداین مایەوە. دەڵێن: لەبەر ئەوە هەڵات چوونکە تاهیر نامەی بۆ نووسی و ئاگاداری کردەوە ئەگەر نەڕوات دەست بەسەر زەوی و سامانەکەیدا دەگرێت.

هەرش (یەکێك لەسەربازەکانی ئەمین) لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی پەنای بردە دوورگەی عەباس کە لەجەنگ بەدوور بوو. دەستەیەك لەشەڕکەرانی تاهیر بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوتن بەڵام هەرش توانی شکستیان پێ بێنێت. تاهیر سوپایەکی دیکەی بۆ هاوکاری سەربازەکانی نارد و شەڕێکی قورسیان لەگەڵ هەرش دەستپێکرد و ژمارەیەکی زۆر لەوان لەناو ئاودا خنکان.

سەرئەنجام ئەمین ڕۆژێك بێزار بوو، وتی: حەزم دەکرد خواوەند ئەم دوو دەستەی لەناو دەبرد تا خەڵکان ڕوخساری ئاسایش و ئارامی ببینن. ئەم دوو دەستەیە دوژمنەکانی منن چوونکە دەستەیەك خوازیاری سامانی منە و دەستەیەك خوازیاری پێگەکەی من. هێزی ئەمین کەمی کرد و سوپاییەکانی بڵاو بوونەوە و لەسەرکەوتنی تاهیرییەکان دڵنیا بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا لەلایەن تاهیر و بەفەرمانی مەئمون ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا مۆتەمەن کوڕی ڕەشید و مەنسور کوڕی مەهدی ڕۆشتنە خوراسان بۆ لای مەئمون. مەئمون مۆتەمەنی بۆ جەرجان ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا گرانی لەئاندۆلۆس هاتە ئاراوە بەشێوەیەك خەڵکان بەیانییان دەکردە شەو و تەنیا بەکەمێك خواردن ڕێگەیان لەبرسیەتی خۆیان دەگرت.

لەم ساڵەدا وەکیع کوڕی جەراحی ڕوئاسی لەفید کاتێك گەڕانەوە لەماڵی خوا، مرد. بەقیە کوڕی وەلیدی حیمسی کەساڵی لەدایك بوونی ١٢٠ کۆچی/٧٣٧ زایینی بوو، مرد. محەممەد کوڕی مەلیح کوڕی سلێمانی ئەسلەمی و موعاز کوڕی موعاز باوکی موسەنای عەنبەری لەتەمەنی حەفتا و حەوت ساڵی، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و هەشتی کۆچی ( ٨١٣ زایینی )

## زاڵبوونی تاهیر بەسەر بەغداد

لەم ساڵەدا خوزەیمە کوڕی خازم پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەمین پچڕاند و پەیوەستی تاهیر بوو. هەرسیمە لەرۆژهەلاتەوە ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

تاهیر پەیامی بۆ خوزەیمە نارد ئەگەر من لەگەڵ ئەمین پەیمانی ئاشتی ببەستم لەگەڵ ئەوەی هاوکاری منت نەکردووە بەڵام بەخششەکانی خۆم لەتۆ دریغ ناکەم و پشتگوێت ناخەم. خوزەیمە بەپێشنیارەکەی تاهیر رازی بوو و ملکەچی خۆی نیشاندا. بەتاهیری وت: ئەگەر تۆ لەبەشی رۆژهەلاتی بەغداد و لەجێگەی هەرسیمە دادەبەزی، ئەمین بەفەرمانەکانت رازی دەبوو چوونکە هەرسیمە بەکەسێکی بڕواپێکراو نازانێت. لەلایەکی دیکە ئەمین لەخەڵکان دەترسێت ئەگەر بەفەرمان بردن لەتۆ رازی ببێت، خوێنی برێژن. ئەمە هیچ ڕێگەیەکی نییە مەگەر ئەوەی دەستەیەك بۆ پشتیوانی کردنی ئەو ڕەوانە بکرێت.

تاهیر لەنامەیەکدا ناتەوانی هەرسیمەی بیرخستەوە و سەرکۆنەی کرد، پێی وت: سوپاییەکانت کۆکردەوە و سامانەکانت بەفیڕۆدا و لەهێرش کردنە سەر سوپای دوژمن خۆت بەدوور دەگریت. ڕێگەم بۆ تۆ تەخت کرد. پردەکانم هەڵبەست و دڵنیام دوو کەس دژایەتی تۆ ناکەن، ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنە و پێشڕەوی بکە.

هەرسیمە وتارەکەی تاهیری خوێندەوە و فەمانبەری هەڵبژارد. تاهیر خوزەیمەی لەم گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە و دەستنوسێکی هاوشێوەی بۆ محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عیسا، پارێزەری پردە (بەنوێنەرایەتی ئەمین کە بەشێوەیەکی نهێنی پەیوەستی تاهیر ببوو) ڕەوانە کرد. لەشەوی چوارشەممە، هەشتی موحەرەم/ هەشتی دێسامبەر خوزەیمە و محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عیسا هێرشیان کردە سەر پردی دیجلە و وێرانیان کرد و محەممەد ئەمینیان لەخەلافەت دوور خستەوە.، سوپای ئوردوگای مەهدی ئارام بوونەوە و دەستیان لەجەنگ هەڵگرت

بەڵام هەرسیمە یەك هەنگاو نەڕۆشتە پیش (لەوان دەترسا) تا ئەوەی دەستەیەك لەسەرکردەکان سوێندیان بۆ خوارد و بەمشێوەیە هەرسیمە ڕۆشتە لایان. حسەین خولەیع لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە:

علینا جمیعا من خزیمة منة　　　بها اخمد الرحمن نائرة الحرب

تولی امور المسلمین بنفسه　　　فذب و حامی عنهم اشرف الذب

ولولا ابو العباس ما انفك دهرنا　　　یبیت علی عتب و یغدو علی عتب

خزیمة لم یذکر له مثل هذه　　　اذا اضطربت شرق البلاد مع الغرب

اناخ بجسری دجلة القطع و القنا　　　شوارع و الارواح فی راحة العضب

واتاکەی: هەمووان سپاسی خوزەیمەمان لەسەر شانە چوونکە خواوەند ئاگری جەنگی بەهۆی ئەوەوە دامرکاند. ئەو کاروباری موسوڵمانانی ڕێکخست و بەباشترین شێوە بەرگری لێکردن. ئەگەر باوکی عەباس نازناوی خوزەیمە نەدەبوو، ڕۆژگاری ئێمە یەك لەدوای یەك شیاوی سەرکۆنە کردن بوو. ئاوا پێشهاتێك لەکاتی پەرێشانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بۆ خوزەیمە دیارینەکراوە (ناوی چاکەی بۆ ئەو بەدواوە نەبووە) لەنێوان دوو پردی دیجلە ڕمەکانی بەرز کردەوە و گیانەکانی بەدەستی تورەیی سپارد.

بۆ ڕۆژی دواتر تاهیر ڕووی کردە مەدینە و کەرخ و لەوێ جەنگێکی ماڵوێرانکەری خستە گەڕ. ئەو لەم جەنگەدا پاشەکشێی بەهەمووان کرد و دوژمن پەنای بۆ کەرخ برد. تاهیر لەکەرخ ڕووبەڕوویان بوویەوە و بەشێوەیەك شکستی پێهێنان، تەنیا ڕێگەچارەیان بەهەڵاتن دەزانی بێ ئەوەی هیچ شتێك ببینن. تاهیر شمشێر بەدەست ڕۆشتە ئەوێ و فەرمانیدا جاڕ بدەن: هەرکەس لەماڵەکەی خۆی بمێنێتەوە، ئەمانی هەیە. ئەو لەبازاری کەرخ و کۆشکی وەزاح بەئەندازەی پێویست سەربازی دانا مەبەستی هێرش کردنە سەر شاری مەنسور (بەغدادی کۆنی) کرد و دەوری شارەکە و کۆشکی زوبەیدە و خولد و باب ئەلجسری تا دەروازەی شام و خوراسان و کوفە و بەسرە و کەنارەکانی سورات تا شوێنی ڕژانی دیجلەی گرت.

حاتەم کوڕی سەقڕ و هەڕش و ئەفریقاییەکان لەجەنگ دژی تاهیر بەردەوام

بوون. تاهیر کۆشکی زوبەیدە و خولدی وێران کرد. ئەمین، دایکی و مناڵەکانی بۆ شاری مەنسور برد و لەرێگە سەربازەکان، کۆیلە و کەنیزەکانیان لێیان جیابوونەوە و کەس گرنگی بەکەس نەدەدا. خراپەکاران و کەسانی پەستیش بڵاوەیان لێکرد. ئەمین لەشاری مەنسور خۆی شاردەوە. تاهیر دەوری شارەکەی گرت و دەستی بەسەر دەروازەکاندا گرت. عەمرۆ ئەلوەراق ئەم هەواڵەی بیست. ئەو داوای پیاڵەیەك مەی کرد و ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

خذها فللخمرة اسماء لها دواء و لها داء

يصلحها الماء اذا اصفقت يوما و قد يفسدها الماء

و قائل كانت لهم وقعة في يومنا هذا و اشياء

قلت له: انت امرؤ جاهل فيك عن الخيرات ابطاء

اشرب و دعنا من احاديثهم يصطلح الناس اذا شاؤوا

واتاکەی: بگرە چوونکە مەی چەندین ناوی هەیە. هەم دەردی هەیە و هەم دەرمان. کاتێك روون و بەتام بێت، ئاو جوانی دەکات و هەندێ کات ئاو بێ تامی دەکات. کەسێك وتی ئەمڕۆ جەنگ (ئاماژەیە بۆ رووداوەکانی بەغداد) و کاری تریان کردووە. پێم وت تۆ پیاوێکی نەزانیت و لەکارە چاکەکان دوور کەوتوویتەوە. بخۆرەوە و ئێمە لەگفتوگۆ سەبارەت بەوان ئاسوودە بکە چوونکە خەڵکان هەرکات بیانەوێت، رێگەی سازان دەگرنەبەر.

ئیبراهیم کوڕی مەهدی دەڵێت کاتێك تاهیر لەشارەکە گەمارۆی خستە سەر ئەمین، ئەو لای ئەمین بووە. دەڵێت: شەوێك ئەمین ڕۆشتەدەر تا رێگە چارەیەك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزێتەوە. رووی کردە کۆشکەکەی خۆی لەخولد. کەسی بەدوای مندا نارد و ڕۆشتمە لای. وتی: جوانی ئەم شەو و جوانی مانگ لەئاسمان و تیشکی ئەو لەکەنارەکانی دیجلە دەبینی؟ کەمێك بادە دەخۆیتەوە؟ وتم: فەرمان فەرمانی تۆیە. مەی خواردەوە و دەرخواردی منیشیدا. دواتر ئاوازێکم بۆ خوێند کەدەمزانی حەزی لێیەتی. ئەمین پێی وتم: لەگەڵ گۆرانیبێژێکی دیکەدا چۆنیت؟ وتم: نیازم پێی نییە. فەرمانیدا کەنیزێکیان بەناوی زەعف هێنا. ناوەکەی ئەوم بەخراپە لێکدایەوە. سەرقاڵ بووین کەئەمین بەکەنیزەکەی وت: بخوێنە. کەنیز ئەم

هۆنراوەی جوعدی خوێند:

كليب لعمرى كان اكثر ناصرا          و ايسر حرما منك ضرج بالدم

واتاکەی: سوێند بەگیانی خۆم کولەیب (لەگەورەکانی عەرەب) زیاتر لەتۆ یار و هاوەڵی نەبوو. گوناحی ئەو کەمتر بوو بەڵام لەناو خوێنی خۆیدا گەوزا.

ئەمین ئەم گۆرانییەی پێ ناخۆش بوو، بەخراپی لێکی دایەوە و وتی: گۆرانییەکی دیکە بخوێنەوە. ئەو کەنیزە ئەمەی خوێند:

ابكى فراقهم عينى فأرقها          ان التفرق للاحباب بكاء

ما زال يعدو عليهم ريب دهرهم          حتى تفانوا و ريب الدهر عداء

واتاکەی: دووری ئەوان چاوەکانمی پڕفرمێسك کرد و خەوی لەچاوەکانم ڕفاند. جیابوونەوە لەیاران گریان هێنەرە. زیانی رۆژگارەکان بەردەوام هێرشی کردە سەریان تا لەناوچوون و زیانەکانی رۆژگار بەردەوام هێرش دەکەن.

لەم کاتەدا ئەمین بەکەنیزەکەی وت: نفرین لەتۆ، ئایا گۆرانییەکەی دیکە نازانیت؟ کەنیز وەڵامی دایەوە: ئەوم خوێند کەگومانم دەکرد پەسەندی دەکەیت. دواتر ئەم گۆرانییەی خوێند:

اما ورب السكون و الحرك          ان المنايا كثيرة الشرك

ما اختلف الليل و النهار و لا          دارت نجوم السماء فى الفلك

الا لنقل النعيم من ملك          قد زال سلطانه الى ملك

و ملك ذى العرش دائم ابدا          ليس بفان و لا بمشترك

واتاکەی: سوێند بەخوای ئارامی و جووڵە، مەرگ چەندین داوی هەیە. هاتوچۆی شەو ورۆژ و سورانی ئەستێرەکانی کاکێشان بۆ ئەوەیە کەپێگەی پاشایەتی لەپاشایەك، بۆ پاشایەکی دیکە بگوازرێتەوە و تەنیا فەرمانڕەوایی خواوەند هەڵگری پاشایەتی هەمیشەییە و لەناو ناچێت و کەس شەریکی نییە.

ئەمین رووی کردە کەنیزەکە و وتی: هەستە، نەحلەتی خوا لەتۆ بێت. کەنیز هەستا و ڕۆشت. ئەمین پیاڵەیەکی بلورینی خۆش کردی لەبەردەم ئەودا دانابوو کەپێیان دەوت (رب رياح) کەنیز قاچی خلیسکا و بەر پیاڵەکە کەوت و شکاندی. ئەمین وتی: هاوار لەتۆ ئەی ئیبراهیم! ئەم کەنیزە بۆ هات و ئەم پیاڵە بۆ شکا؟

سوێند بەخوا گومان دەکەم ژیانی من کۆتایی هاتووە. وتم: خواوەند فەرمانڕەوایەتیت پایەدار بکات و دوژمنت لەناو ببات. هێشتا کۆتاییمان بەگفتوگۆکەمان نەهێنابوو، بیستمان: ئەو کارەی راوێژتان لەبارەوە دەکرد، کۆتایی پێهات. ئەمین وتی: ئەی ئیبراهیم! تۆیش ئەوەت بیست کەمن بیستم؟ وتم: هیچم نەبیست (لەکاتێکدا بیستبووم) وتی: لای رووبارەوە هیچ نابیستیت؟ لەرووبارەکە نزیك بوومەوە بەڵام هیچم نەبینی. دانیشتین و درێژەمان بەگفتوگۆدا بەڵام دووبارە ئەو دەنگە بیسترایەوە. ئەمین خەمبار هەستا و بۆ کۆشکەکەی گەڕایەوە. یەك دوو شەو زیاتری نەخایاند کەدایکی لەپرسکەیدا دانیشت.

## کوژرانی ئەمین

کاتێك ئەمین ڕۆشتە شاری مەنسور و تاهیر دەستی بەسەر بازارەکانی کەرخ و دەوروبەریدا گرت و لەشارەکە مایەوە، فەرماندە و سەرکردەکانی ئەمین زانیان توانای بەرگری کردنیان نییە، لەزاڵبوونی تاهیر ترسان. محەممەد کوڕی حاتەم کوڕی سەقر و محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەبی ئەفریقی و دەستەیەکی دیکە هاتنە لای ئەمین و وتیان: بارودۆخ بەم شێوەیە کەدەیبینی. بۆچوونی خۆمان دەخەینە بەردەم تۆ، لێکۆڵینەوەی لێ بکە و لەبڕیاری خۆت ئاگادارمان بکەرەوە هیوادارین خێر و خۆشی بەدواوە بێت. ئەمین وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟ وتیان: خەڵکان لەدەوری تۆ بڵاوەیان لێکردووە و دوژمنان دەوریان گرتوویت. تەنیا حەوت هەزار ئەسپی ڕەسەن بۆ تۆ ماوەتەوە. بۆچوونی ئێمە ئەوەیە حەوت هەزار کەس لەسەربازە بوێرەکانت هەڵبژێریت و سوار لەسەر ئەسپەکان شەوانە لەیەکێك لەدەروازەکان بڕۆیتەدەر. بەخواستی خوا کەس لەبەرابەر ئێمە خۆڕاگری ناکات. ئێمە دەڕۆین تا دەگەینە جەزیرە و شام و لەوێ باج وەردەگرین و لەسەرزەمینێکی بەربڵاو فەرمانڕەواییەکی تازە بنیات دەنێین. لەم کاتەدا خەڵکان لەدەوری تۆ کۆدەبنەوە و سوپاییەکانت چیتر شوێن پێی تۆ هەڵناگرن.

ئەمین وتی: بۆچوونێکی پەسەندە و مەبەستی ئەنجامدانی کرد. تاهیر لەم گفتوگۆیە ئاگادار بوویەوە. (سیخوڕەکانی ئەو لەهەموو شوێنێکدا بوون) ئەو

بەسلێمان کوڕی مەنسور و محەممەد کوڕی عیسا کوڕی نەهیك و سندی کوڕی شاهەك نامەیەکی لەم شێوەی نووسی: سوێند بەخوا ئەگەر لەم مەبەستەی پەشیمانی نەکەنەوە، هیچ زەوییەکتان بۆ ناهێڵمەوە و جگە لەکوشتنتان هیچ مەبەستێکی دیکەم نابێت.

ئەم دەستە ڕۆشتنە لای ئەمین و پێیان وت: لەمەبەستەکەت ئاگادار بووینەوە. سوێند بەخوا و بەگیانی تۆ، ئەم دەستەی ئەم بۆچوونەیان پێشنیار کردووە، تەنیا دەستەیەك خراپەکارن کەزەختی گەمارۆ بۆ ئەم کارە ناچاری کردوون و دەزانن لای براکەت و تاهیر ئەمانیان پێ نادرێت چوونکە لەجەنگ دژی ئەوان بەردەوام بوون. ئێمە لەگیانی تۆ دڵنیا نین ئەگەر لەگەڵ ئەوان بڕۆیت، دەترسین زیندانیت بکەن و سەرت لەجەستە جیا بکەنەوە و بیکەنە بەڵگە و هۆکارێك بۆ وەرگرتنی ئەمانی خۆیان. چەندین بەڵگەیان بۆ وتەکانی خۆیان هێنایەوە. ئەمین وتەکانی ئەوانی پشتراست کردەوە و ڕازی بوو داوای ئەمان بکات و بڕواتەدەر. ئەم دەستەیە پێیان وت: تۆ تەنیا رابواردن و خۆش گوزەرانیت دەوێت و براکەت ئەم نیازانەت دابین دەکات و پێگەیەکی تایبەتت پێ دەبەخشێت و ئەوەی دڵت بخوازێت، بۆتی ئامادە دەکات و هیچ زیانێك لەو بەتۆ ناگات. ئەمین ئەم بۆچوونەی پەسەند کرد وبڕیاریدا تەسلیمی هەرسیمە کوڕی ئەعیەن ببێت.

ئەو دەستەی پێشنیاری ڕۆشتن بۆ شامیان پێکرد، هاتنە لای ئەمین و وتیان: ئەگەر بەپێشنیارەکەی ئێمە ڕازی نابیت و بەپێشنیاری ئەم کاسە لێسانە ڕازی دەبیت، باشترە تەسلیمی تاهیر ببیت نەك هەرسیمە کوڕی ئەعیەن. ئەمین وتی: تاهیرم خۆش ناوێت چوونکە لەخەودا بینیم لەسەر دیوارێکی خشتی بەرز وەستابووم. بناغەی ئەم دیوار پان و هیچ دیوارێکم بەپانی ئەم دیوارە نەبینیبوو. جل و بەرگی ڕەشم پۆشیبوو و شمشێرم بەکەمەرەوە هەڵواسیبوو. تاهیر لەبن دیوارەکە وەستاو ئەوەندەی لێدا کەدیوارەکە ڕووخا، کەوتمە خوار و کڵاوەکەم لەسەر کەوت. ئەم خەوەم بەشێوەیەکی خراپ لێکدایەوە و تاهیرم خۆش ناوێت لەکاتێکدا هەرسیمە موالی ئێمەیە و بۆ ئێمە وەك باوکە. زیاتر لەو نزیکم و زیاتر بڕوام بەو هەیە.

ئەمین کەسی نارد و داوای ئەمانی لەهەرسیمە کرد. هەرسیمە ئەمانی پێدا و سوێندی خوارد ئەگەر مەئمون مەبەستی کوشتنی ئەو بکات، دژی مەئمون دەجەنگێت. تاهیر لەم کارە ئاگادار بوویەوە و بەناخۆشی زانی و بڕیاریدا لەڕۆشتنی ئەمین بۆ لای هەرسیمە ڕێگری بکات. تاهیر وتی: ئەمین لەلایەن سوپاکەی منەوە گەمارۆی خراوەتەسەر و من گۆڕەپانم بۆ تەسلیم بوونی ئەو تەسك و تەنگ کردووە و بەناچاری پێشنیاری ئەمانی کرد. لەبەر ئەمە ڕێگە نادەم بڕواتە لای هەرسیمە و ئەم نازناوە بەو ببڕێت.

کاتێك هەرسیمە و فەرماندەکان لەوتەکانی تاهیر ئاگادار بوونەوە، هەموویان لەماڵی خوزەیمە کوڕی خازم کۆبوونەوە. تاهیر و فەرماندەکانی، سلێمان کوڕی مەنسور و سندی و محەممەد کوڕی عیسا کوڕی نەهیك هاتن و ڕاوێژیان کرد. ئەوان تاهیریان ئاگادار کردەوە کەئەمین هیچ کات تەسلیمی ئەو نابێت وئەگەر ئەوەی ئەمین داوای کردووە، ئەنجام نەدرێت ئەگەری هەیە پێشهاتەکانی ڕۆژگاری حسەین کوڕی عەلی کوڕی ماهان سەر لەنوێ ڕوویداتەوە (دووبارە کەسانێك هاوکاری ئەمین بکەن و لەسەر تەختی خلافەت داینیشێنن) وتیان: ئەمین خۆی دێتە لای هەرسیمە و ئەنگوستیلە و مۆری خەلافەت بەتۆ دەسپێرێت و ئەمە واتە هەموو خەلافەت، کەواتە ئەم دەرفەتە لەدەست مەدە. تاهیر بەداواکەیان ڕازی بوو.

بەڵام کاتێك هەرش ئاگادار بوویەوە، مەبەستی ئەوەی کرد خۆی لەتاهیر نزیك بکاتەوە. لەسەر ئەم بنەمایە بەتاهیری وت کەگفتوگۆی نێوان ئەوان و سەرکردەکانی دیکە فریوئامێز بووە و ئەنگوستیلە و مۆری خەلافەت تەسلیمی هەرسیمە دەکرێت. تاهیر توڕە بوو و لەبەرە ئەمە لەدەوری کۆشکی دایکی ئەمین وکۆشکەکانی خولد دەستەیەکی دانا وکەسی لەم کارە ئاگادار نەکردەوە. کاتێك ئەمین بۆ ڕۆشتن بۆ لای هەرسیمە خۆی ئامادە کرد، پێش ڕۆشتن تینویەتییەکی جەرگبڕ یەخەی گرت، وتیان ئاوی لەئەنباری بۆ بێنن بەڵام ئەنبار ئاوی لێ نەبوو. شەوی یەکشەممە، بیست و پێنجی موحەرەمی ساڵی ١٩٨/ ٢٥ دێسامبەری٨١٣ زایینی دوای نوێژی خەوتنان بەجل و بەرگی سپی و کڵاوی ڕەش هاتە حەوشی کۆشکەکەی. هەرسیمە پەیکی نارد کە: بەپێی پەیمانەکە هاتووم تۆ لەگەڵ خۆم

ببەم، بەڵام باشتر وایە ئەم شەو نەبیت چوونکە لای رووبار شتێك دەبینم کەگومانی لا دروست کردووم، دەترسم دژی تۆ راپەڕن و تۆ لەدەستی من بڕفێنن و بەمشێوەیە هەم تۆ بکوژرێیت هەم من. ئەمشەو بمێنەرەوە تا خۆم ئاسوودە بکەم و شەوێکی دیکە دێم وئەگەر دژی تۆ راپەڕین، بەرگریت لیٚ دەکەم. ئەمین بەنێردراوی وت: بگەڕێرەوە بۆ لای هەرسیمە و پێی بڵی، چیتر کاتمان بەدەستەوە نەماوە، هەنووکە بۆ لای ئەو بەرێدەکەوم وناتوانم تا بەیانی خۆم رابگرم.

ئەمین لەکاتێکدا پەرێشانی بەسەریدا زاڵ ببوو، وتی: خەڵك، خزمەتکارەکان و پاسەوانەکان و هەموو کەسان ڕۆشتوون و دەترسم تاهیر لەمە ئاگادار ببێتەوە و مەبەستی من بکات و لەگەڵ خۆی بمبات. دواتر دوو کوڕەکەی خۆی بانگ کرد و لەئامێزی گرتن و بەدەم گریانەوە ماچی دەکردن. ئەمین پێی وتن: ئێوە دووانە بەخواوەندی مەزن دەسپێرم. ئەمەی وت و بەقۆلی کراسەکەی فرمێسکەکانی سڕی. سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و ڕۆشتە کەنار رووبار. بەلەمی جەنگی هەرسیمە ئامادە بوو. ئەمین سەرکەوت.

ئەحمەد کوڕی سەلام کەسەرپەرەستی دامەزراوەی داد بوو، دەڵێت: لەناو بەلەمەکە هاورێیەتی هەرسیمەم دەکرد، کاتێك ئەمین هات، بۆ رێز گرتن هەستاینە سەر پیٚ. هەرسیمە لەسەر دوو ئەژنۆی خۆی دانیشت و لەوەی نەیدەتوانی لەسەر پیٚ بێستێت، داوای بەخشینی کرد. ئەمینی لەئامێز گرت و سەری خستە سەر داوێنی خۆی، دەست و پیٚ و چاوەکانی ماچ کرد. هەرسیمە فەرمانی ڕۆشتنیدا کە لەناکاو بەلەم سوارەکانی تاهیر هێرشیان کردە سەرمان و بەدەم هاوارەوە بەلەمەکەی ئێمەیان کون کرد. ئاو هاتە ناو بەلەمەکە و نەغرۆ بوو. هەمووان کەوتینە ناو ئاوەکە. لێخوڕی بەلەمەکە قژی هەرسیمەی گرت و لەئاوەکە دەریهێنا. ئەمین کەکەوتبووە ناو ئاوەکە، جلەکانی خۆی دڕاند و خۆی گەیاندە کەنارەکان. یەکێك لەپیاوەکانی تاهیر منی گرت و بۆ لای تاهیری بردم و پێی وت لەو کەسانەم لەناو بەلەمەکەی هەرسیمە دەستگیر کراوم. تاهیر پرسی: کێیت؟ وتم: ئەحمەد کوڕی سەلام، سەرپەرەستی دامەزراوەی داد و موالی سەروەری باوەڕداران، وتی: درۆ دەکەیت، راستی بڵیٚ. وتم: ئەوەی وتم راست بوو. وتی: خەلیفەی لەسەر

کارلابراو چی کرد؟ وتم: بینیم کەوتە ئاوەکە و جلەکانی دڕاند. تاهیر سوار ئەسپەکەی بوو، پەتێکی کردە ملم و بەدوای خۆیدا رایدەکێشام. توانای ڕاکردنم نەما. فەرمانیدا سەر لەجەستەم جیاکەنەوە. گیانی خۆم بەدە هەزار درهەم کڕییەوە. منی لەماڵێك زیندانی کرد تا درهەمەکان وەربگرێت. چەند راخەڕ و حەسیر و دوو پشتی لەم ماڵەدا دەبینرا.

دوای تێپەڕینی چەند کاژێریکی دیکە لەشەو، دەرگایان کردەوە و ئەمینیان فرێدایە ژوور. رووت بوو و تەنیا پانتۆڵێکی لەپێ و عەمامەیەکی لەسەردا بوو. لای من بەجێیان هێشت. وتم: هەمووان لەلایەن خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. گریام: ناوی منی پرسی: خۆم پێ ناساند. وتی: باوەشم بگرە چوونکە ترساوم. سەلاّم دەڵێت: لەئامێزم گرت. لێدانی دڵی زیادی کردبوو. لەم کاتەدا وتی: ئەی ئەحمەد، مەئمونی برام چی بەسەرهات؟ وتم: زیندووە. وتی: خواوەند روخساری نامەبەری ئەوان (کەسانی دەوروبەری خۆی) قێزەون بکات چوونکە دەیوت مەئمون مردووە (ئەمینیان فریو دەدا) نامەبەر دەیوت: مەئمون بەجەنگ دژی ئەو رازی نەبووە و لەبەر ئەمە کوژراوە. وتم: خواوەند روخساری راوێژکارانی تۆ قێزەون بکات. وتی: گومان دەکەیت چ بەلاّیەك بەسەر من دێنن؟ ئایا دەمکوژن یا پێبەندی ئەمانەکەی خۆیان دەبن؟ وتم: رێز لەئەمانەکەی خۆیان دەگرن.

ئەمین خۆی لەجلەکانییەوە دەئالاّند. عاباکەی خۆم پێدا و وتم: ئەمە بە بەسەر خۆتا.

سەرقاڵی گفتوگۆ بووین لەناکاو پیاوێك هات. سەیری روخساری ئێمەی کرد. ئەوم ناسییەوە. محەممەد کوڕی حومەیدی تاهیری (لەشوێنکەوتە و فەرماندەکانی تاهیر) بوو. کاتێك ئەوم بینی زانیم ئەمین دەکوژرێت. لەنیوەی شەو دەرگا کرایەوە و دەستەیەکی ناعەرەب، بەشمشێری دەرکێشراو هاتنە ناو. کاتێك ئەمین ئەوانی بینی، وەستا و بەردەوام دەیوت: هەمووان لای خواوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. سوێند بەخوا لەرێگەی خوادا خوێنم ڕژا. ئایا کەس نییە هاوکاریم بکات یا پەنام بدات؟ ئایا کەس لەئەبنا (مناڵە ئێرانییەکان کەخەلافەتی مناڵەکانی

عەباسییان دامەزراند) نییە فریای من کەوێت؟ ئەوان هاتن و لای ئەو ژووری ئێمەی تیا زیندانی کرابووین، وەستان. یەکتریان بۆ هاتنە پێش هان دەدا. ئەمین پشتییەکەی کردە قەڵغانی خۆی و دەیوت: هاوار لەئێوە، من کوڕی مامی پێغەمبەری ئێوەم، من کوڕی هارونم، من برای مەئمونم، خواوەندا، خواوەندا، یەکێك لەوان هاتە پێش و نووکی شمشێری لەناوچاوی نزیك کردەوە. ئەمین بەپشتییەکەی کێشای بەروخساریدا و ویستی شمشێرەکەی لێ بستێنێت. ئەو پیاوە هاواری کرد: منی کوشت، منی کوشت. دەستەیەك هاتن و یەکێك لەوان شمشێرەکەی لەکەلەکەی ئەمین چەقاند. ڕژانە سەر ئەمین و لەپشتەوە سەریان بڕی و سەرە بڕاوەکەیان بردە لای تاهیر و جەستەکەیان بەجێهێشت.

بۆ بەیانی جەستەی ئەویان خستە ناو جەواڵێك وبردیان. تاهیر، سەری ئەمینی بەبورجێکەوە هەڵواسی و خەڵکانی بەغداد بۆ بینینی لەماڵەکانیان هاتنەدەر. تاهیر جاڕی دەدا: ئەمە سەری خەلیفەی لەسەر کار لابراو محەممەد ئەمینە.

کاتێك ئەمین کوژرا، سەربازەکانی بەغداد و سوپاکەی تاهیر لەکوژرانی ئەو پەشیمان بوونەوە. تاهیر، سەری ئەمینی بەکوڕە مامەکەی محەممەد کوڕی حسەین کوڕی موسعەب بۆ لای مەئمون نارد و لەگرتنی بەغداد ئاگاداری کردەوە. کاتێك سەری ئەمین گەیشت، زوریاستین خستیە سەر قەڵغانێك و کاتێك مەئمون بینی، ناوچاوی خستە سەر خاك. تاهیر مۆر و ئەنگوستیلەی خەلافەتی بۆ ناردبوو.

کاتێك دانیشتووانی مەدینە ئاگادار بوونەوە لەوەی تاهیر فەرمانی کوشتنی ئەمینی بەکۆیلەکەی یانی قوڕەیش داوە، پیرەپیاوێك لەوان وتی: پاك و گەورەیە خواوەند، بەخەڵکانی خۆمان دەوت قوڕەیش خوێنی ئەمین دەرێژێت و باوەڕمان وابوو هۆزی قوڕەیش خوێنی ئەو دەرژێت بەڵام پیاوێك بەم ناوە ئەو کارەی کرد.

کاتێك ئەمین کوژرا، بانگی ئەمانیان لەناو خەڵکان بەرز کردەوە و کاتێك هەمووان ئارام بوون، تاهیر لەرۆژی هەینی ڕۆشتە ناو بەغداد و خەڵکان لەپشت سەری ئەو نوێژیان خوێند. ئەو بەناوی خەلیفە مەئمون وتارێکی خوێندەوە، سەرکۆنەی ئەمینی کرد و بۆ موعتەسەم یا بەگومانێك مناڵی مەهدی نامەیەکی نووسی: دوای سپاسی خواوەندی پەروەدگار، بۆ من دژوارە بۆ یەکێك لەبنەماڵەی

خەلافەت بیٚ سەرنامە (ئەمیر) نامەیەك بنێرم بەلاٚم بیستوومە تۆ خوازیاری گەڕانەوەی خەلیفەی لەسەر كار لابراویت، چوونكە ئەگەر بەوشێوە بێت، ئەم نامەیەش بەزیادە دەزانم و ئەگەر جیاواز لەوە بێت، سلاٚو لەتۆ ئەی ئەمیر و خواوەند پێگەی تۆ پایەدار بكات.

كاتێك ئەمین كوژرا، ئیبراهیم كوڕی مەهدی پرسەنامەیەكی بۆ نووسی:

| | |
|---|---|
| عوجا بمغنى الطلل الداثر | بالخلد ذات الصخر و الاجر |
| و المرمر المنسوب يطلى به | و الباب باب الذهب الناضر |
| عوجا بها فاستقينا عندها | على يقين قدرة القادر |
| و ابلغا عنى مقالا الى | المولى على المأمور و الامر |
| قولا له يابن ابى الناصر | طهر بلاد الله من طاهر |
| لم يكفه ان حز اوداجه | ذبح الهدايا بمدى الجازر |
| حتى أتى يسحب اوداجه | فى شطن، هذا مدى السائر |
| قد برد الموت على جنبه | فطرفة منكسر الناظر |

واتاكەی: لەو شوێنە وێرانكراوە بوگزەرێن، لەكۆشكی خولد كە لەبەرد و خشت و مەرمەڕی تراشدارو دروست كرابوو و درگایەكی زێڕین و درەخشانی بۆ دانرابوو، لەویٚ بوگزەرێن و بەتوانایی خواوەندی بەتوانا بیٚ گومان بن. ئەم وتەیە لەمن بەسەروەری فەرمانبەر و فەرمانڕەوا بگەیێنن. پێی بلێن ئەی كوڕی باوكی ناسر! سەرزەمینی خواوەند لەتاهیر پاك بكەرەوە. مەگەر ئەو بەسی نەبوو ڕەگی ملی بڕی هاوشێوەی قوربانییەكان كە بەكێردی قەساب دەبڕدرێن تا ئەو جێگەی ئەندامەكانی ئەوی بەتەناف رادەكێشا. جەستەی ئەوی خستە ناو جەوال وپێشێلی كرد. مەرگ پەیكەری ئەوی سارد كردەوە. چاوی نیوە كراوە و ڕوانینی تێكشكاو بوو.

كاتێك مەئمون ئەم پرسەنامەی بیست، تورەیی خوێنی هێنایە كولٚ.

## تایبەتمەندییەکان، ژیان و خەلافەتی ئەمین

دەڵێن: محەممەد ئەمین ڕۆژی پێنجشەممە نۆزدەی جومادی الاول ساڵی ١٩٣/ نۆی مەی ٨٠٨ زایینی خەلافەتی گرتەدەست و شەوی یەکشەممە بیست و چواری موحەرەمی ساڵی ١٩٨/ ٢٤ دێسامبەری ٨١٣ زایینی سەری لەجەستە جیا کرایەوە. نازناوی ئەو باوکی موسا یا باوکی عت بوو. ئەو مناڵی ڕەشید هارون کوڕی باوکی عەبدوڵلەی مەهدی کوڕی باوکی جەعفەری مەنسورە. دایکی زوبەیدە کچی جەعفەر گەورترین مناڵی مەنسورە. خەلافەتی ئەو چوار ساڵ و هەشت مانگ و پێنج ڕۆژ درێژەی کێشا. وتوویانە لەنیوەی جومادی الاخر خەلافەتی گرتەدەست. ساڵەکانی تەمەنی لەبیست و هەشت کۆتایی پێهات. مووی سەری ساف و درێژ بوو، تەوقە سەری مووی پێوە نەبوو، چاوەکانی ورد، لوتی هەڵۆیی، قۆز و باڵابەرز و ئێسك پان و چوار شانە بوو. لەروسافە (گەورەترین بەشی شاری بەغداد و بەشی ڕۆژهەڵاتەکەی) چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

کاتێك مەئمون لەکوژرانی ئاگادار بوویەوە، مۆڵەتی هاتنی بەسەرکردەکاندا. فەزڵ کوڕی سەهل نامەی خەلافەتی مەئمونی خوێندەوە. هەمووان پیرۆزباییان لێکرد و لەخواوەند پاڕانەوە.

مەئمون فەرمانی بۆ تاهیر و هەرسیمە نووسی تا قاسم کوڕی مۆتەمەن لەجێگری خەلافەت لاببەن. ئەوان لەرەبیع الاولی ئەم ساڵە/ئۆکتۆبەری ٨١٣ ئەویان لەسەر کار لابرد.

شاعیرەکان چەندین هۆنراوەیان بۆ پرسەی ئەمین هۆنیوەتەوە، ئێمە پشتگوێیان دەخەین چوونکە چتیر بابەتێکی مێژوویی نین. یەکێك لەم هۆنراوانە هۆنراوەی حسەین کوڕی زوحاکە کەیەکێك بوو لەهاونشینەکانی ئەمین. باوەڕی بەمەرگی ئەو نەبوو و بەردەوام چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکرد:

یاخیر اسرته و ان زعموا     انی علیك لمثبت اسف

الله یعلم ان لی کبدا     حری علیك و مقلة تکف

و لئن شجیت بما رزئت به     انی لاضمر فوق ما اصف

هلا بقیت لسد فاقتنا     ابدا و کان لغیرك التلف

قد كان فيك لمن مضى خلف و لسوف يعوز بعدك الخلف
ى بات رهطك بعد هفوتهم انى لرهطك بعدها شنف
هتكوا بحرمتك التى هتكت حرم الرسول و دونها السجف
و ثبت اقاربك التى خذلت و جميعها بالذل معترف
تركوا حريم ابيهم نفلا و المحصنات صوارخ هتف
ابدت مخلخلها على دهش ابكارهن ورنت النصف
سلبت معاجرهن و اجتليت ذات النقاب و نوزع الشنف
فكانهن خلال منتهب در تكشف دونه الصدف
ملك تخون ملكه قدر فوهى و صرف الدهر مختلف
هيهات بعدك ان يدوم لنا عز و ان يبقى لنا شرف
افبعد عهد الله تقتله و القتل بعد امانه سرف
فستعرفون غدا بعاقبة عز الاله فأوردوا وقفوا
يا من تخون نومه ارق هدت الشجون و قلبه لهف
قد كنت لى املا غنيت به فمضى و حل محله الاسف
مرج النظام و عاد منكرنا عرفا و انكر بعدك العرف
و الشمل منتشر لفقدك والدنـ يا سدى و البال منكسف

واتاكەی: ئەی باشترینی بنەماڵەی خۆت! هەرچەند ئەوان گومان دەکەن بەڵام من بۆ تۆخەمبار و دڵ بەداخم. خواوەند دەزانێت لەخەمدا جەرگێکی سوتاوم هەیە و چاوێکی گریاناوی. ئەگەر لەم زیانە خەمبارم، زیاتر لەوەی دەیهێنمە سەرزمان، لەدڵمدایە. بۆ نەمایتەوە بۆ ئەوەی هەمیشە نیازەکانی ئێمە بەدی بێنیت و تەنیا تۆ لەناوچوویت. تۆ هاوشێوەی خەلیفەکانی پێشوو بوویت بەڵام دوای تۆ کەسی هاوشێوەی تۆ نابینین. کەسانی تۆ دوای بێ ئاگایی چیتر بەئاسوودەیی ناخەون و دوای ئەو بێ ئاگاییە، چیتر من بەدوژمنیان دەزانم. بەشکستی پێگەی تۆ، ڕێزی پێغەمبەر(د.خ) شکا. خزمەکانی تۆ کەهاوکارییان نەکردیت، هەستاون و هەمووان دان بەریسوایی خۆیاندا دەنێن. سنووری باوکیان بەکەسانی دیکە سپارد وکەسانی ناو پەردە (ژن و منداڵ) هاوار و ناڵەیان بەرز کردەوە. کیژەکان لەتاو

سەرلێشێوان خەڵخاڵەکانی خۆیان نیشاندا و بەتەمەنەکان گریانیان دەست پێکرد. سەرپۆشەکان تالاَن کرا، روخسار پۆش، ئاشکرا و گوارەکان لەگوێ دەرهێنران. دەڵێی لەکاتی تالاَنی هاوشێوەی ئەو مرواریيانە بوون کەسەدەفیان پێوە نەمابوو. پاشایەك بوو کەچارەنوس فەرمانڕەوايەتی ئەوی کەم کردەوە و فەرمانڕەوايەتی لاواز بوو، رووداوەکانی زەمانە جۆراوجۆرە. ئەی تاهیر، چۆن دوای پەیمانی خوایی ئەوت کوشت، چوونکە کوشتن دوای بەخشین ئەمان هەرزەگەرییە. بەیانی لەرۆژی هەستانەوە هێزی خواوەند دەبینیت، بڕۆن و درەنگ بکەن. ئەو کەسەی بێداری و بێ خەوی خەوی لێ حەرام کردووە (بەخۆی دەڵێت) خەمەکان دامرکايەوە بەلاَم دڵی تۆ هێشتا خەمبارە. جێگەی هیوای من بوویت کەپێی بەتوانا بووم بەلاَم ڕۆشت و پرسە لەجێگەیدا مایەوە. دوای تۆ کاروبارەکان شڵەژان و قێزەون جێگەی جوانی گرتەوە. لەنەبوونی تۆ کۆبوونەوە بەرەو بلاَوە لێکران ڕۆشت، دنیا بێهودە بوو و دڵ، پەرێشان.

خوزەیمە کوڕی حەسەن پرسەنامەیەکی لەزمانی دایکی ئەو، زوبەیدە، بۆ مەئمون هۆنییەوە. نازناوی زوبەیدە دایکی جەعفەر بوو:

| | |
|---|---|
| لخير امام قام من خير عنصر | و افضل سام اعواد منبر |
| لوارث علم الاولين و فهمهم | و للملك المأمون من ام جعفر |
| كتبت و عينى مستهل دموعها | اليك ابن عمى من جفونى و محجرى |
| وقد مسنى ضر و ذل كابة | و ارق عينى يابن عمى تفكرى |
| و همت لما لاقيت بعد مصابه | فامرى عظيم منكر جد منكر |
| سأشكو الذى لاقيته بعد فقده | اليك شكاة المستضيم المقهر |
| و ارجو لما قد مربى مذ فقدته | فأنت لبثى خير رب مغير |
| اتى طاهر لا طهر الله طاهرا | فما طاهر فيما أتى بمطهر |
| فاخرجنى مكشوفة الوجة حاسرا | و انهب اموالى و اخرب أدورى |
| يعز على هارون ما قد لقيته | وما مربى من ناقص الخلق اعور |
| فان كان ما ابدى بامر امرته | صبرت لامر من قدير مقدر |
| تذكر امير المؤمنين قرابتى | فديتك من ذى حرمة متذكر |

واتاکەی: پەیامی من بۆ باشترین پێشەوا کە لەباشترین نەژادە وچاکترین کەس بۆ سەر مینبەر، ئەو هەڵگری زانست و تێگەشتنی پێشینان، مەئمونی پاشا، لەلایەن دایکی جەعفەر(زوبەیدە دایکی ئەمینی کوژرا). کاتێك ئەم نامەیە دەنووسم، فرمێسك لەچاوانم دەبارێنم ئەی کوڕە مام (چوونکە هارون کوڕی مامی زوبەیدە بوو) زیان و بەلاّ بەسەرمندا دابارییوە و ریسوایی و پەژارە و ئەندێشە، ئەی کوڕی مام! خەوی لەچاوەکانی من فڕاندووە. من دوای پرسەی ئەو (ئەمین) ئاوارەی بیابانەکان بووم و بارودۆخم سەخت و دژوار بووە. هەرچی دوای لەدەست دانی ئەمین بەسەرم بێت، هاوشێوەی کەسێکی دۆڕاو سکالاّ بۆ لای تۆ بەرز دەکەمەوە. دوای ئەوەی ئەمینم لەدەست دا، تۆ هاوشێوەی چاکترین کەس بۆ لێکۆڵینەوە لەسکالاّکەم دەزانم. تاهیر کەخوا ئەو لەگوناحەکەی پاك نەکاتەوە، گوناحکاری کرد و بۆ ئەم گوناحە هەرگیز نابەخشرێت. ئەو منی بەسەر و روخساری رووت هێنایەدەر و سامانەکانی تالاّن کردم و کۆشکەکانی منی کردە وێرانە. ئەوەی لەدەست ئەم ئافرێنراوە یەك چاوە بەسەر من هات، بۆ هارون گران و ناپەسەندە. ئەگەر ئەوەی روویدا بەفەرمانی تۆ بوو، من بەفەرمانی خوا، خۆڕاگری دەکەمە پیشەت، ئەی سەروەری باوەڕداران، خزمایەتی منت لەبیر بێت، گیانم بەقوربانی تۆ.

کاتێك مەئمون ئەم هۆنراوەی خوێندەوە، دەستی بەگریان کرد و وتی: سوێند بەخوا تۆڵەی براکەم دەستێنم. خواوەند بکوژەکانی ئەو بکوژێت.

حسەین کوڕی زوحاك لەپرسەی ئەمین زێدەڕۆیی کرد و مەئمونی سەرکۆنە کرد و لەبەر ئەمە مەئمون مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووری پێنەدەدا وتا زەمانێك وەسفی ئەوی نەدەبیست تا ئەوەی رۆژێك ئەوی بانگ کرد و وتی: پێم بڵێ ئایا ئەو رۆژەی براکەم کوژرا، خوێنی هیچ ژنێك لەمناڵەکانی هاشمیان ڕشت یا پەردەی رێزی ئەویان دڕاند؟ وتی: نە. مەئمون وتی: کەواتە ئەم هۆنراوە چییە؟

| | |
|---|---|
| و مما شجا قلبی و کفکف عبرتی | محارم من کل النبی استحلت |
| و مهتوکة بالخلد عنها سجوفها | کعبا کقرن الشمس حین تبدت |
| اذا خفرتها روعة من منازع | لها المرط عاذت بالخشوع و رنت |

و سرب ظباء من ذؤابة هاشم هتفن بدعوى خير حى و ميت
ارد يدا منى اذا ما ذكرته على كبد حرى و قلب مفتت
فلابات ليل الشامتين بغبطة و لا بلغت لآمالها و تمنت

واتاکەی: ئەوەی من خەمبار دەکات و فرمێسك لەچاوەکانم دەبارێنێت ئەوەیە پێگەی و پەردەی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) درا. لەکۆشکی خولد لەو کیژانە پەردە هەڵگیرا کەکاتێك دەرکەوتن روخساریان وەك مانگ بوو، ئەگر دەستدرێژیکەرێك، قژی ئەو راکێشێت، لەشەرما، سەردادەخات و دەناڵێنێت. یەك رانە ئاسك لەمناڵەکانی هاشم بەدۆعای باشترین مردووەکان و زیندووەکان، هاوار دەکەن. هەرکات ئەو رووداوە بیر دێنمەوە دەست دەخەمە سەر جگەری سووتاو و دڵی لەت لەتم. ئەوانەی لەداماوی کەسانی دیکە شادمان بوون، شەویان ناکەنە رۆژ و بەئارەزووەکانی خۆیان ناگەن.

ئەو لەوەلآمدا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دڵ سووتانەوەیەك بەسەر مندا زاڵ بوو و لەناکاو خەمێك دڵی گرتم چوونکە نیعمەتێکم لەدەستدابوو و دڵی منی لێوانلێو کرد و سپاس بۆ چاکەکاری زمانی منی کردەوە و خەمی مردنی گەورەم، ناخی منی پەرێشان کرد. شیاوە سزام بدەیت و شیاوە لێم خۆش بیت. فرمێسك لەچاوەکانی مەئمون هاتەخوار و وتی: تۆم بەخشی و فەرمانم دا رۆژانەکەت نۆ درهەم دیاری بکەم و پاداشتی ئەوەی لەدەستت داوە، وەریبگریتەوە. بۆ سزادانی تۆ ئەوە بەسە هەندێ کات مۆڵەتی هاتنە ژوورەم پێ نەدایت.

مەئمون ئەوی بەخشی و وەسفەکانی ئەوی بیست. یەکێك لەهۆنراوەکانی ئەمەیە:

لم نبكيك لماذا؟ للطرب يا ابا موسى، و ترويج اللعب
و لترك الخمس فى اوقاتها حرصا منك على ماء العنب
و شنيف انا لا ابكى له و على كوثر لا اخشى العطب
لم تكن تعرف ما حد الرضى لا ولا تعرف ما حد الغضب
لم تكن تصلح للملك و لم تعطك الطاعة بالملك العرب
لم نبكيك؟ لما عرضتنا للمجانيق و طورا للسلب

فی عذاب و حصار مجهد　　　سدد الطرق، فلا وجه الطلب
زعموا انك حی حاشر　　　کل من قد قال هذا فکذب
لیته قد قاله فی وجدة　　　من جمیع ذاهب حیث ذهب
اوجب الله علینا قتله　　　و اذا ما اوجب الامر وجب
کان والله علینا فتنة　　　غذب الله علیه و کتب

واتاکەی: ئەی باوکی موسا! بۆ تۆ ناگریم، بۆ؟ بۆ ئەوەی شادیمان بلاو کردبێتەوە و تا پێنج فەرزەی نوێژ لەئارەزوومەندیمان بۆ ئاوی تری، پشت گوێ بخەین. بۆ شەنیفیش ناگرین و لەکەوسەریش ناترسین. تۆ نەسنووری رەزامەندی دەزانیت و نەئەندازەی تورەیی دەناسیت. تۆ شیاوی پاشایەتی نین و عەرەبەکان لەکاروباری پاشایەتی گوێرایەڵی فەرمانەکانی تۆ نین. بۆ تۆ ناگرین کەئێمەت گرفتاری قەلاکوتەکان کرد و هەندێ کات گیرۆدەی دەستی تالانچییەکان. ئێمە لەئەشکەنجە و گەمارۆ تاقەت پروکێن بووین تا ئەو جێگەی رێگاکان بەسترابوون و تەنانەت رێگەی خۆیشمان. گومان دەکەن تۆ زیندوویت و هەڵدەستیتەوە، هەرکەس ئەمە دەڵێت، درۆی کردووە. خۆزگە ئەو کەسەی ئەم باوەڕەی هەیە، بۆ ئەو جێگە بڕوات کەئەو ڕۆشت. خواوەند کوشتنی ئەوی لەسەر ئێمە فەرز کرد و هەرچی خواوەند فەرزی بکات، دەبێت ئەنجام بدرێت. سوێند بەخوا بۆ ئێمە هۆکاری ئاژاوە بوو، خواوەند لێی تورە و ئەم چارەنووسەی لەناوچاوی نووسی.

ئاماژەیان بەهۆنراوەی دیکەیش داوە بەڵام لەترسی درێژدادڕی پشتگوێمان خست.

## شێواز و هەڵس و کەوتی ئەمین

کاتێك ئەمین خەلافەتی گرتەدەست و مەئمون نامەی بۆ نووسی و لەبەیعەتی خۆی ئاگاداری کردەوە، بەدوای پیاوە خەساوەکاندا گەڕا و بەهایەکی فراوان ئەوانی کڕی و شەو ڕۆژ لەگەڵ ئەوان دەڕۆشتە شوێنێك دوور لەچاوی خەڵکان، لەگەڵ ئەوان دەیخوارد و دەیخواردەوە و دەبێت و نەبێتەکانی بەوان سپارد. دەستەیەك لەوانی کردە خزمەتکار و بەجراویە ناوی بردن و دەستەیەك

لەحەبەشییەکان کە بەغەرابییە ناوی بردن. بەرادەیەك پشتی کردە ژنان و کەنیزەکان کەگومانی خراپی لێکرا (ئەویان بەپیاو پەسەند یا نێربان) لەقەڵەمدا. لەمبارەوە چەندین هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە کەیەکیان وەك نمونە دەهێنینەوە:

الا يا ايها الثاوى بطوس — عزيبا ما يفادى بالنفوس
لقد ابقيت للخصيان هقلا — تحمل منهم شوم البسوس
فأما نوفل فالشان فيه — و فى بدر، فيالك من جليس
و ما للمعصمى شئ لديه — اذا ذكروا بذى سهم خسيس
و ما حسن الصغير اخس حالا — لديه عند مخترق الكؤوس
لهم من عمره شطر و شطر — يعاقر فيه شرب الخندريس
و ما للغانيات لديه حظ — سوى التقطيب بالوجه العبوس
اذا كان الرئيس كذا سقيما — فكيف صلاحنا بعد الرئيس
فلو علم المقيم بدار طوس — لعز على المقيم بدار طوس

واتاکەی: ئەی ئەوکەسەی لەخاکی توسدا خەوتوویت و لەوەی گیانی بەفیدا دەکەن، بەدووریت، بۆ خاجەکان (خەساوەکان) هاوسەرێکت بەجێ هێشتووە و لەوان تەنیا شوومی وشترێکی بەدیاری بردووە کەبێ دەست پیا هێنان، شیری نییە. بەڵام نەوفل (کۆیلەی خەساوی ئەمین) کەهەموو کارەکان لەدەستی ئەودایە و بەدر (کۆیلەیەکی خەساوی دیکە) هاوار چ هاونشنێکن! مەعسەمیش کاتێك لای ئەو ناویان ببەن، بەهرەیەکی کەمی هەیە. ئەو کاتەی پیاڵەکان بەرز دەکرێنەوە حەسەنی بچوکیش بارودخێکی نزمتری نییە. بەشێك لەژیانی ئەو تایبەت بەوان و بەشەکەی دیکەی بەشەراب خواردنەوە بەسەر دەبات. ژنە جوان روخسارەکان لای ئەو هیچ بەشێکیان نییە جگە لەناوچاوی گرژ و روخسارێکی تاڵ. ئەگەر پێشەوای خەڵکان بەمشێوەیە ناتەندروستە، چۆن ئێمە لەدوای ئەم سەرکردە، کاروبارەکانمان رێکدەخرێت. ئەگەر ئەو کەسەی لەناو گۆڕی توسدا خەوتووە، ئەمەی دەزانی، زۆری بەلاوە گران و ناخۆش دەبوو (یانی هارون)

ئەمین بۆ گۆرانیبێژەکان پەیکی بۆ هەموو شارەکان نارد و ئەوانی کردە هاودەمی خۆی و رۆژانەی بۆ دیاری کردن. رێگەی دوو برا و بنەماڵەکەی خۆی

ئەدەدا بڕۆنە بارەگاکەی وئەوان و فەرماندەکانی خۆی بەریسوا و سوک دەزانی و سامانی گەنجینەی لەنێوان کۆیلە خەساوەکان، گۆرانیبێژەکان و چیرۆك خوانەکان، دابەش دەکرد. فەرمانیدەدا ماڵەکان بۆ گەشت و گەڕان و شوێنە شاراوەکان بۆ رابواردن ئامادە بکەن. پێنج بەلەمی شەڕکەری هاوشێوەی شێر و فیل و هەڵۆ و مار وئەسپ دروست کرد و خستیە ناو رووباری دیجلە. بۆ دروست کردنی ئەم بەلەمانە بڕەپارەیەکی زۆری خەرج کرد. باوکی نەواس لەمبارەوە دەڵێت:

سخر الله للامين مطايا      لم تسخر لصاحب المحراب

فاذا ما ركابه سرن برا      سار فى الماء راكبا ليث غاب

عجب الناس اذ رَاوك على صو      رة ليث تمر مر السحاب

سبحوا اذ رأوك سرت عليه      كيف لو ابصروك فوق العقاب

ذات زور و منسر و جناحيـ      ـن تشق العباب بعد العباب

تسبق الطير فى السماء اذا ما      استعجلوا بجيئة و ذهاب

واتاکەی: خواوەند بەئەمین ئەو سوارییانە[١٠] بەخشی کە بەسلێمانی نەبەخشیبوو. سوارییەکانی ئەو دەڕۆشتە

وشکانی و سوار لەسەر شێری دارستان دەڕۆشتە ناو ئاو. خەڵکان سەریان سوڕدەمێنێت هەرکاتێك تۆ دەبینن کە روخساری شێر هاوشێوەی هەور گوزەر دەکەیت. ئەو کاتەی تۆ لەسەر ئاو دەبینن، ناوی خواوەند بەپاکی دەهێننە سەرزمان چ بگات بەوەی تۆ سوار لەسەر هەڵۆیەك ببینن کەسینە و دەندوك و دوو باڵی هەیە و شەپۆلەکان یەك لەدوای یەك دەبڕێت و لەباڵندەی ئاسمان کەهاتوچۆی ئەوان بەخێرا لەقەڵەم دەدەن، پێش دەکەوێت.

کەوسەر دەڵێت: ئەمین فەرمانیدا لەکۆشکی خولد سفرەیەکی بۆ ئامادە بکەن و بەزمێکی بۆ برازێننەوە. ڕاخەرێکیان بۆراخست هاوشێوەی گوڵزار و دیبا لەگەڵ چەندین ڕاخەری دیکە بەهەمان شێوە، چەندین دەفری زێرین و زیوینیان لەسەر سفرەکە دانا. دواتر فەرمانی بەسەرپەرەستی کەنیزەکانیدا سەد کەنیز کەدە دە عودیان بەدەستەوە بێت، بڕۆنە لای و یەك دەنگ و بەیەك ئاواز بخوێنن. دەستەی

[١٠] ئەوەی سواری دەبن وەك کەشتی، چوار پێ یا هەر شتێکی دیکە

یەکەم ئەمەیان خوێند:

هم قتلوه کی یکونوا مکانه　　　　　كما غدرت يوما بكسرى مرازبه

واتاکەی: ئەوان ئەویان کوشت تا لەجێگەکەی دانیشن، بەهەمان شێوە کەسنووردارەکانی خوسرەو خیانەتیان لێکرد.

ئەمین جوێنی پێدان و دووری خستنەوە و دە گۆرانیبێژی دیکەی بانگ کرد:

من كان مسرورا بمقتل مالك　　　　　فليات نسوتنا بوجه نهار

واتاکەی: هەرکەس لەکوژرانی مالك شادمان بێت، لەکاتی ڕۆژ دێتە لای ژنەکانی ئێمە.

ئەمین هاوشێوەی دەستەی یەکەم ئەوانیشی جوێنباران کرد و دەری کردن، لەئەندێشەدا نقوم بوو، ئەوسا وتی دەستەی سێیەم بێن. ئەوان خوێندیان:

كليب لعمري كان اكثر ناصرا　　　　　و ايسر جرما منك ضرج بدم

واتاکەی: سوێند بەگیانی خۆم کەلیب هەم هاوەڵانی زیاتری بوو هەم گوناحەکەی بچوکتر بەڵام لەخوێنی خۆیدا گەوزا.

لەم کاتەدا ئەمین لەشوێنەکەی هەستا و فەرمانیدا سەکۆکە وێران بکەن چوونکە ئەم دانیشتنەی بەشووم دەزانی.

دەڵێن: لای فەزڵ کوڕی سەهل (وەزیری مەئمون) ناوی ئەمینیان برد. وتی: چۆن کوشتنی محەممەد ڕەوا نییە لەگەڵ ئەوەی شاعیرەکەی لەبەزمەکیدا ئەم هۆنراوەی هۆنیوەتەوە:

الا فاسقنی خمرا و قل لی هی الخمر　　　　　و لاتسقنی سرا اذا امكن الجهر

واتاکەی: هان، مەی دەرخواردی من بدە و بڵێ ئەم بادەیە و ئێستا کەبەئاشکرا دەتوانین مەی بخۆینەوە، مەیشارەوە.

ئەمین لەم داستانە ئاگادار بوویەوە و باوکی نەواس (شاعیری ئەم هۆنراوەی) زیندانی کرد. ئێمە (کوڕی ئەسیر) لەکردەوکانی ئەو دوور ئەندێشی یا دادپەروەری یا بەئەزمونی یا کردەوەیەکی پەسەندی دیکەمان نەبینی باسی بکەین.

## شۆڕشی سوپا دژی تاهیر

لەم ساڵەدا پێنج رۆژ دوای کوژرانی ئەمین، سوپا دژی تاهیر شۆڕشی کرد. هۆکاری شۆڕشەکە ئەوە بوو سوپاییەکان داوای پارەیان دەکرد و ئەو پارەی پێ نەبوو. لەبەر ئەمە سوپا ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە. تاهیر گومانی دەکرد ئەم شۆڕشە بەهۆی کەین و بەینی خەڵکانی بەغداد وکەسانی دەوروبەری سوپاکەی هەڵگیرساوە و ئەوان لەگەڵ سوپاییەکانی هاودەست بوون. کەسانی بەغداد هیچ دەستێوەردانێکیان بۆ ئەم شۆڕشە نەبوو بەڵام تاهیر لەگیانی خۆی ترسا و هەڵات و شۆڕشییەکان بەشێك لەسامانی ئەویان تاڵان کرد. تاهیر پەنای بردە عەقرقوف.

تاهیر دوای کوژرانی ئەمین فەرمانیدا بوو پارێزگاری لەدەروازەکانی شار بکەن و زوبەیدە دایکی ئەمین و دوو کوڕەکەی ئەمین، موسا و عەبدوڵلەی لەناو بەلەمێکی جەنگی بۆ هومەینیا لەزابی سەرو برد. دواتر فەرمانیدا موسا و عەبدوالله بۆ خوراسان بۆ لای مەئمون ڕەوانە بکەن.

کاتێك سوپاییەکان دژی تاهیر شۆڕشیان کرد، هاواریان کرد ئەی موسا ئەی مەنسور (یانی موسا سەرکەوتووە). ئەو رۆژە و بەیانی ئەو رۆژەیان بەمشێوەیە بەسەر برد. خەڵکان بەباشیان زانی تاهیر دوو مناڵەکەی ئەمین ڕەوانە بکات. تاهیر کاتێك بۆ عەقرقوف هەڵات، دەستەیەك لەفەرماندەکان هاورێیەتیان دەکرد. ئەو بۆ جەنگ لەگەڵ شۆڕشیەکان سوپای رازاندەوە. کاتێك هەواڵی هێرشی تاهیر بەسەرکردەی شۆڕشییەکان و سەرکردەکانی بەغداد گەیشت، ڕۆشتنە لای و داوای بەخشینیان کرد و ئەم شۆڕشەیان خستە ئەستۆی گەنجە نەزانەکان و داوایان لێکرد چاو لەم کارەیان بپۆشێت. تاهیر ئەوانی بەخشی.

تاهیر دەیوت: لێرە نەڕۆشتم مەگەر بۆ ئەوەی شمشێر لەکالان دەرهێنم، سوێند بەخوا ئەگەر جارێکی دیکە ئەم رێگەیە بگرنەبەر، شمشێر بەکار دەبەم و بەوەی پەسەندی ناکەن، گرفتار دەبن. ئەم وتەیە ورەی ئەوانی رووخاند. تاهیر فەرمانیدا مووچەی چوار مانگیان پێ بدەن.

دەستەیەك لەپیر و گەورەکان و پێشەوا ئایینییەکانی بەغداد ڕۆشتنە لای تاهیر. باوکی شێخ کوڕی عومەیرەی ئەسەدی لەناویاندا دەبینرا. سوێندیان بۆ خوارد

نەخەڵکانی بەغداد و نەکەسانی نزیك بەغداد کەس لەم شۆڕشەدا بەشداری نەکردووە و بوونە دەستەبەری ئەوەی کەس شۆڕش نەکات. بەمشێوەیە ئاگری تورەیی تاهیر دامرکایەوە و لەکارەکەی ئەوان چاوی پۆشی و جەنگ کۆچی کرد و خەڵکان لەرۆژهەلاّت و رۆژئاوا ملکەچی فەرمانەکانی مەئمون بوون و وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

## ناسازگاری نەسر کوڕی شەبەسی عوقەیلی لەگەڵ مەئمون

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی سەیار کوڕی شەبەسی عوقەیلی رێگەی ناسازگاری مەئمونی گرتەبەر. ئەو لەهۆزی مناڵەکانی عوقەیل و دانیشتووی کەیسوم لەکەناری باکوری حەلەب بوو. بەیعەتی لەگەڵ ئەمین بەستبوو و خوازیاری خەلافەتی ئەو بوو. کاتێك ئەمین کوژرا، تورەیی نەسر بڵێسەی سەند و دەستی بەسەر سەرزەمینە سنووریەکاندا گرت و سومەیساتی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و عەرەبەکان و تەماحکارانی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. هێزی نەسر زیادی کرد و لەفورات تا بەشی رۆژهەلاّت بلاّو بوویەوە. ئەندێشەی گرتنی ئەو ناوچەی لەسەردا پەروەردە کرد. کاتێك خەڵکان هێزی ئەویان بینی، لەدەوری کۆبوونەوە و پێگەی ئەوەندی دیکە گەورەتر بوو. بەرادەیەك هێزی و توانای زیادی کرد کەبەخواستی خوا دواتر ئامارژەی پێدەدەین.

## فەرمانڕەوای حەسەن کوڕی سەهل لەعێراق و سەرزەمینەکانی دیکە

لەم ساڵەدا مەئمون، حەسەن کوڕی سەهل برای فەزڵ (زوریاستین)ی وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینە کوێستانییەکان (کرمانشاهان– زاگرۆس)، عێراق، پارس، ئەهواز، حیجاز، یەمەن و ئەو سەرزەمینانەی تاهیر دوای کوژرانی ئەمین دەستی بەسەردا گرتبوو، دیاری کرد. نامەی بۆ تاهیر نووسی تا ئەم سەرزەمینانە بەحەسەن بسپێرێت. حەسەن پێشتر عەلی کوڕی باوکی تاهیر سەعیدی ڕەوانە کرد و تاهیر لەدانی باج خۆی دوا دەخست تا ئەوەی عەلی مووچەی سوپاییەکانی بێ

کەم و کوڕی دا و تاهیر کاروبارەکانی پێسپارد.

حەسەن لەساڵی ١٩٩ کۆچی/ ٨١٤ زایینی هات و کارگوزارەکانی خۆی بۆ سەرزەمینەکان ڕەوانە کرد. فەرمانی بەتاهیردا بۆ سەرکوت کردنی نەسر کوڕی شەبەسی عوقەیلی بەرەو رەققە بڕوات. ئەو، موسڵ، جەزیرە، شام و مەغریبی خستە ژێر فەرمانی تاهیرەوە. تاهیر بۆ جەنگی نەسر بەرێکەوت. پەیکی بۆ نەسر نارد و پێشنیاری فەرمانبەری پێکرد و داوای لێکرد دەست لەدژایەتی و ناسازگاری هەڵگرێت بەڵام نەسر وەڵامی نەدایەوە. تاهیر بەرێکەوت و لەکەنارەکانی کەیسوم ڕووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕێکی مەترسیداریان خستەگەڕ. نەسر ئەزمونێکی جوانی لەخۆی بەجێهێشت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. تاهیری تێکشکاو بۆ رەققە گەڕایەوە.

زۆرترین هەوڵی تاهیر ئەوە بوو ئەم کەنارانە بپارێزێت.

مەئمون فەرمانی بۆ هەرسیمە نووسی و فەرمانی پێدا رێگەی خوراسان بگرێتەبەر.

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد ریَ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## جەگی رەبەز لەکوردوبا

لەم ساڵەدا لەکوردوبا جەنگ روویدا و رەبەز ناوی دەرکرد. هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو حەکەم کوڕی هوشامی ئومەوی، پاشای کوردوبا، بەردەوام سەرقاڵی خوشگوزەرانی ومەی خواردنەوە و کارەکانی دیکە بوو، دەستەیەك لەسەرکردەکانی کوردوبای کوشت و لەبەر ئەم کارە خەڵکی ئەو شارە لێی بێزار بوون و بەردەوام کێشەیان بۆ سوپاکەی دەنایەوە و جوێنیان پیَ دەدان. شۆڕش لەناو خەڵکان گەشتە ئەو جێگەی کاتی بانگدان دەیانوت: نوێژ، ئەی سەرخۆش، نوێژ. دەستەیەکیش ئەم قسەیان بەحەکەم وت: کاتێك حەکەمیان دەبینی، بۆ گاڵتە پێکردن، دەستیان لەیەك دەدا. حەکەم کوردوبای کردە سەنگەر و بورج و دیوارەکەی بەرز کردەوە و بەدەوری شارەکە خەندەکی هەڵکەند. ژمارەیەکی زۆر

سواری کۆکردەوە و موالییەکانی خۆی زیاد کرد و دەستەیەکی گەورەی لەدەوری خۆی پێکەوەنا کەبەردەوام سیلاح بەدەست، پاسەوانیان دەدا. ئەم ڕق و کینەی خەڵکانی کوردوبای زیاتر کرد و دڵنیا بوون لەوەی حەکەم ئەم کارانەی کردووە تا تۆڵەیان لێ بستێنێتەوە.

حەکەم بێ هیچ دڵسۆزییەك،ماڵیاتی سەرشانی ئەوانی زیاد کرد. خەڵکان نەیانتوانی بەرگەی ئەم کارە بگرن. حەکەم دە کەس لەسەرکردەی خراپەکارانی ئەوانی کوشت وچوارمێخەی کێشان. خەڵکانی ڕەبەز ئەم کردەوەیان بەگەورە و نەشیاو بۆ رازی بوونم لەقەڵەمدا و ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە.

ئەوەی ئاگری ئەم جەنگەی خۆش کرد ئەوە بوو کەکۆیلەیەك شمشێرەکەی خۆی بەمەبەستی ئاودان بردە لای شارەزای ئەم کارە تا ژەنگەکەی لێ بسرێتەوە و ئەو کەسە بۆ ئەم کارە کەمتەرخەمی کرد. کۆیلەکە تووڕە بوو و بەشمشێر لەوکابرای دا و دەستبەجێ کوشتی. ئەم ڕووداوە لەرەمەزانی ئەم ساڵە/ئاوریلی ٨١٢ ڕوویدا.

سەرەتا خەڵکانی ڕەبەز شمشێریان دەرکێشا و کەسانی دەوربەری خۆیان بەسیلاح تەیار کرد. سوپاییەکان و ئومەوییەکان و کۆیلەکان لەکۆشك کۆبوونەوە و حەکەم چوارپێ و کەرەستەی جەنگی لەنێوان ئەواندا دابەش کرد و هاوەڵانی خۆی کردە دەستە دەستە. جەنگی نێوان ئەم دوو سوپایە دەستی پێکرد و خەڵکانی ڕەبەز سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و دەوری کۆشکی حەکەمیان گرت. حەکەم لەسەرەوەی کۆشکەکە هاتەخوار، زرێی پۆشی و سوار لەسەر ئەسپ، سوپاکەی بۆ جەنگ هاندا. سوپاییەکان جەنگێکی بوێرانەیان دەست پێکرد.

حەکەم فەرمانی بەکوڕە مامەکەی خۆی، عوبەیدالله) دا دیوارەکە بڕوخێنێت و لەگەڵ دەستەیەك لەوێ بڕوات. ئەو بێ ئەوەی خەڵکانی ڕەبەز هەستی پێ بکەن لەپشتەوە هێرشی کردەسەریان و لەرەبەز ئاگرێکی گەورەی هەڵگیرساند و خەڵکەکەی کوشت. ئەوان بەخوێن جۆگەلەکانیان دروست کرد و هەموو کەسانی ناو ماڵەکانیان کوشت و ژمارەیەکیان ئەسیر کرد. حەکەم لەناو ئەسیرەکان سێسەد کەس لەگەورەکانی هەڵبژارد و سەری بڕین و سەرەوخوار لەخاچیدان. ئەوان بۆ

ماوەی سێ ڕۆژ لەگەڕەکی ڕەبەز، سوتاندیان، کوتایان، فڕاندیان، بردیان و دزییان.

حەکەم لەگەڵ عەبدلکەریم کوڕی عەبدولواحید کوڕی عەبدولموغیس راوێژی کرد چوونکە کەس هاوشێوەی ئەو لەحەکەمەوە نزیك نەبوو. پێشنیاری بەحەکەم کرد لەوان خۆش ببێت. کەسانی دیکە پێشنیاری کوشتاری ئەوانیان دەکرد بەڵام حەکەم بەوتەکەی عەبدولکەریم رازی بوو و ئەمانی پێ بەخشین و جاڕیدا ئەگەر دوای سێ ڕۆژ کەسێك لەخەڵکانی ڕەبەز ببینێت، خوێنی دەرێژێت و لەخاچی دەدات. ئەوانەی مابوونەوە بەشێوەیەکی نهێنی هەڵاتن، ژن و منداڵ و سامانەکانی خۆیان هەڵگرت و پیادە و سوار لەسەر هەر چوارپێیەك کەدەستیان کەوت، کوردوبایان بەجێهێشت. سەربازان و خراپەکاران بۆسەیان بۆ نانەوە و سامانی ئەوانیان تالآن کرد و هەرکەس خۆڕاگری دەکرد، دەکوژرا.

دوای سێ ڕۆژ، حەکەم دەستی لەکوشتاری خەڵکان هەڵگرت و هەمووانی لەیەك شوێندا کۆکردەوە و فەرمانی وێران کردنی ڕەبەزی کۆنی دەرکرد.

بەزیع کۆیلەی ئومەییە کوڕی عەبدولرەحمانی ئەمیر کوڕی معاویە کوڕی هوشام بەتاوانی مرۆڤ کوژی لەزیندانی کوردوبا زیندانی بوو. دوو بەندی ئاسنینی قورسیان بەقاچەوە بەستبوو. کاتێك زانی خەڵکانی کوردوبا بەسەر سوپاییەکاندا زاڵبوون، داوای لەزیندانوانەکە کرد رزگاری بکات تا دژی شۆڕشییەکان بجەنگێت. ئەوان پەیمانیان لێ وەرگرت ئەگەر زیندوو مایەوە دەبێت بۆ زیندان بگەڕێتەوە و بەمشێوەیە ئەویان لەزیندان هێنایەدەر. ئەو هاتە گۆڕەپانی جەنگ و بوێرانە جەنگا بەشێوەیەك کەسی بوێری وەك ئەویان لەناو سوپاکەدا نەبینی. کاتێك خەڵکانی ڕەبەز سەرکوت کران، گەڕایەوە بۆ زیندان. حەکەم ئاگادار بوویەوە و ئازادی کرد و بەخشینەکانی خۆی پێ بەخشی. دەستەیەك دەڵێن ئەم ڕووداوە لەساڵی ٢٠٢/ ٨١٧ زایینی ڕوویداوە.

## جەنگی موسڵ ناسراو بەرووداوی مەیدان

لەمساڵەدا جەنگی ناسراو بەرووداوی مەیدان لەموسڵ لەنێوان یەمانییەکان و نەزارییەکان هەڵگیرسا. هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو عوسمان کوڕی نوعەیمی بورجومی ڕۆشتە دیاری موزێر و سکالای لەئەزدییەکان و یەمەنییەکان کرد و وتی: ئەوان ستەممان لێ دەکەن و مافەکانی ئێمە دەخەنە ژێرپێ. داوای هاوکاری لێکردن. نزیکەی بیست هەزار سەرباز لەگەڵ ئەو ڕێگەی موسڵیان گرتەبەر. عەلی کوڕی حەسەن کە لەو کاتەدا فەرمانداری موسڵ بوو، نوێنەرێکی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد و لەهۆکاری هاتنی پرسی. ئەوان هۆکارەکەیان بۆ باس کرد و حەسەن کوڕی عەلی بەڵێنیدا مەبەستەکانی ئەوان بێنێتەدی بەڵام عوسمان ڕازی نەبوو. عەلی لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر ڕووبەڕوویان بوویەوە. دوو سوپا لەیەك نزیك کەوتنەوە و شەڕێکی قورس ڕوویدا و نەزارییەکان شکستیان خوارد و عەلی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆر لەوانی کوشت و بۆ سەرزەمینەکەی خۆی گەڕایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا حەسەن هەرش لەگەڵ دەستەیەك لەسەرسەرییەکان و ژمارەیەکی زۆر لەبیابان نشینەکان شۆڕشی کرد و بانگەوازی ڕەزامەندی بنەماڵەی محەممەدی بەرز کردەوە (بانگەواز بۆ ڕەزامەندی بنەماڵەی محەممەد بۆ کەسێکی نەناسراو کەدوای سەرکەوتنی خۆیان بەهەڵبژاردنی ئەو شادمان دەبن بەو مەرجەی لەبنەماڵەی محەممەد بێت و ئەمە باوەڕی شیعەکانی بنەماڵەی محەممەد بوو). ئەو گەیشتە ڕووباری نیل لەعێراق، باجی وەرگرت و سامانی خەڵکە گوند نشینەکانی تاڵان کرد.

لەم ساڵەدا سوفیان کوڕی عویەیینە لەمەککە کۆچی دوایی کرد. ئەو لەساڵی ١٠٩ کۆچی/٧٢٨ چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی مەهدی لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی و یەحیا کوڕی سەعید قەتان لەمانگی سەفەر، مردن. یەحیا لەساڵی ٧٣٧/١٢٠ چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و نەوەد و نۆی کۆچی ( ٨١٤ زایینی )

## دەرکەوتنی کوڕی تەباتەبای عەلەوی .

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوالله محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەدەی جومادی الاخر/٢٥ ژانویە لەکوفە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو بانگەوازی بۆ ڕەزامەندی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) وگەڕانەوە بۆ قورئان و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ) هان دەدا. بەتەباتەبا ناوی دەرکردبوو. باوکی سەرا یا سەری کوڕی مەنسور بەفەرمانی ئەو فەرماندەیی جەنگی لەئەستۆدا بوو. ئەو باوەڕی بوو کە لەمناڵەکانی هانی کوڕی قەبیسە کوڕی هانی کوڕی مەسعودی شەیبانییە.

هۆکاری شۆڕشەکەی ئەوە بوو کاتێک مەئمون تاهیری لەفەرمانڕەوایی ئەو سەرزەمینانەی دەستی بەسەردا گرتبوو، دوور خستەوە و حەسەن کوڕی سەهلی بۆ ئەم ناوچانە ڕەوانە کرد، خەڵکانی عێراق لەناو خۆیاندا وتیان فەزڵ کوڕی سەهل، جڵەوی مەئمونی لەدەست گرتووە و کەسێکی خۆپەسەندە. مناڵەکانی هاشم و سەرکردەکانی خەڵك توڕە بوون و بوێرییان بەرابەر بەحەسەن کوڕی سەهل نیشاندا و لەهەموو شارەکان ئاگری شۆڕش بڵێسەی سەند. یەکەم کەس کە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە، تەباتەبا لەکوفە بوو.

دەڵێن: هۆکاری پەیوەست بوونی باوکی سەرایا بەتەباتەبا ئەوە بوو لەسەرەتاوە هیچ پێگەیەکی ئەوتۆی نەبوو و هێدی هێدی پێگەی بەرز بوویەوە. دەستەیەك لەدەوری کۆبوونەوە. دواتر خوێنی پیاوێکی خەڵکی جەزیرەی ڕشت و لەگەڵ سامانەکەی ئەو هەڵات. شوێنی کەوتن بەڵام خۆی شاردەوە و لەفوراتەوە ڕووی کردە شام. ئەو لەم کەنارانە دزی و ڕێگرتنی کردە پیشە و دواتر لەگەڵ سی سوار پەیوەستی یەزید کوڕی مەزیدی شەیبانی لەئەرمەنستان بوو. یەزید ئەوی وەك فەرماندە دیاری کرد. باوکی سەرایا لەگەڵ یەزید دژی خوڕەمییەکان دەجەنگی. زیانی زۆری لەواندا و ژمارەیەکی زۆر لەوانی کوشت و باوکی شوك،

کۆیلەی یەزیدی ڕزگار کرد کە لەدەستی ئەواندا دیل بوو.

دوای لابردنی ئەسەد لەفەرمانداری ئەرمەنستان باوکی سەرایا پەیوەستی ئەحمەد کوڕی مەزید بوو. ئەحمەد ئەوی وەك فەرماندەی سوپاکەی هەڵبژارد و لەئاژاوەی نێوان مەئموون و ئەمین بۆ جەنگ دژی هەرسیمە ڕەوانەی کرد چوونکە باوکی سەرایا بەبوێری ناوی دەرکردبوو. هەرسیمە نامەی بۆ نووسی و دڵنەوایی کرد. باوکی سەرایا پەیوەستی بوو. عەرەبەکانی جەزیرەیش پەیوەستی بوون. باوکی سەرایا سامانێکی زۆری لەهەرسیمە وەرگرت و لەناو ئەواندا دابەشی کرد. نزیکەی دو هەزار سوار و پیادە پەیوەستی بوون و بەسەردار بانگیان دەکرد.

کاتێك ئەمین کوژرا، هەرسیمە مووچەی خۆی و سوپاکەی کەم کردەوە. باوکی سەرایا داوای مۆڵەتی ڕۆشتن بۆ ماڵی خوای کرد. هەرسیمە مۆڵەتی پێدا و بیست هەزار درهەمی پێ بەخشی. ئەم سامانەی لەناو هاوڕێیانی خۆیدا بەخشییەوە و داوای لێکردن یەك یەك و دەستە دەستە بەدوای شوێنی کەون. ئەو کارەیان کرد و ژمارەیان گەیشتە دووسەد کەس. لەگەڵ ئەوان ڕێگەی عەین تەمری گرتەبەر و دەوری گرت. سامانی کارگوزارەکەی وەرگرت و لەناو هاوەڵانی خۆیدا دابەشی کرد. درێژەی بەڕێگەی خۆیدا و لەڕێگە ڕووبەرووی کارگوزارێکی دیکە بوویەوە کەباجی لەسەر سێ ئێستر دانابوو. باوکی سەرایا باجەکەی فڕاند و درێژەی بەڕێگەی خۆیدا. لەم کاتەدا ڕووبەرووی سوپایەك بوویەوە کەهەرسیمە بۆ گرتنی ئەو ڕەوانەی کردبوو. باوکی سەرایا ڕووبەروویان بوویەوە و جەنگی و توانی شکستیان پێ بێنێت. ڕووی کردە سارا و پارە و سامانی لەناو هاوەڵانی خۆیدا بەخشییەوە. سوپاییەکان و ئەو کەسانەی نەیانتوانیبوو، پەیوەستی بن، خۆیان گەیاند و ژمارەی هاوەڵانی زیادی کرد. باوکی سەرایا ڕێگەی دەقوقی گرتەبەر. فەرمانداری ئەو ناوچە باوکی زەرغامەی عێجلی بوو کە لەگەڵ حەوتسەد سوار فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی دەکرد. باوکی سەرایا هێرشی کردەسەر و فەرماندار هەڵات. پەنای بردە بەر کۆشکی دەقوق و باوکی سەرایا گەمارۆی خستە سەر کۆشکەکە و ئەمانی پێ بەخشی تا لەکۆشکەکە بێتەدەر. باوکی سەرایا هەموو سامانەکەی لێسەند. دواتر ڕێگەی ئەنباری گرتەبەر کەفەرماندارەکەی

ئیبراهیم شەرەوی موالی مەنسور بوو. باوکی سەرایا هێرشی کردە سەر و کوشتی. سامانی ئەو سەرزەمینەی هەڵگرت و درێژەی بەرێگەی خۆیدا. لەکاتی دروێنە گەڕایەوە و دەستی بەسەر هەموو بەرهەمەکاندا گرت.

باوکی سەرایا لەبیابان گەڕی بێزار و مەبەستی شاری ڕەققەی کرد. رووی کردە تەوق کوڕی مالکی تەغلەبی کە لەگەڵ هۆزەکانی قەیسییە دەجەنگی. باوکی سەرایا هاوکاری کرد. ئەو بۆ ماوەی چوار مانگ بێ هیچ چاوەڕوانییەك و تەنیا بۆ هاوکاری هۆزی رەبیعە شەڕی لەگەڵ موزێرییەکاندا کرد. تەوق سەرکەوتنی بەدەست هێنا و قەیسییەکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون.

باوکی سەرایا رێگەی ڕەققەی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە ئەو سەرزەمینە، محەممەد کوڕی ئیبراهیم ناسراو بەتەباتەبای بینی. باوکی سەرایا بەیعەتی لەگەڵ کرد. کوڕی تەباتەبا پێی وت: تۆ سوار لەسەر کەشتی و لەرێگەی ئاو، بەرەو کوفە بڕۆ و من لەرێگەی وشکانییەوە و لەکوفە پەیوەستی یەك دەبین. هەردووك گەیشتنە ئەو شارە. سەرەتا باوکی سەرایا ڕۆشتە کۆشکی عەباس کوڕی موسا کوڕی عیسا. سامان و زێر و زیوی بێ ئەندازەی ئەو کۆشکەی فڕاند. خەڵکانی کوفە بەیعەتیان لەگەڵ کردن.

دەڵێن: هۆکاری یاخی بوونی باوکی سەرایا ئەوە بوو ئەو لەسوپاکەی هەرسیمە دەجەنگی. هەرسیمە لەدانی مووچە خۆی دوادەخست. باوکی سەرایا توڕە و رووی کردە کوفە و بەیعەتی لەگەڵ کوڕی تەباتەبا کرد و دەستی بەسەر کوفەدا گرت. خەڵکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون. خەڵکان لەکوفە و بیابانەکانەوە دەهاتن و بەیعەتیان لەگەڵ دەکرد. کارگوزاری کوفە سلێمان کوڕی مەنسور بەنوێنەرایەتی حەسەن کوڕی سەهل بوو. حەسەن، سەرکۆنەی سلێمانی کرد (کەنەیتوانی خۆڕاگری بکات) و زوهەیر کوڕی موسەییبی زەببی لەگەڵ دەهەزار سوار و پیادە ڕەوانەی کوفە کرد. کوڕی تەباتەبا و باوکی سەرایا رووبەرووی بوونەوە. لەگوندی شاهی لەبەرابەر یەك ریزیان بەست و توانییان سەرکەوتن بەدەست بێنن و ئوردووەکەی ئەویان تالان کرد. ئەم رووداوە لەکۆتاییەکانی جومادی الاخر/١٣ فەوریە روویدا.

بەیانی ئەو ڕۆژە لەسەرەتای مانگی ڕەجەب، محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی تەباتەبا، بەهۆی ئەو ژەهرەی باوکی سەرایا دەرخواردیدا، مرد چوونکە کوڕی تەباتەبا ڕێگەی تالآن کردنی تالآنییەکانی سوپاکەی زوهەیری لێگرت. خەڵکان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی کوڕی تەباتەبا بوون. باوکی سەرایا دڵنیابوو لەوەی بەبوونی کوڕی تەباتەبا کەس فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ ناکات و لەبەر ئەمە ژەهرخواردی کرد و کوشتی. ئەو لەجێگەی کوڕی تەباتەبا مێردمنداڵێکی هەڵبژارد بەناوی محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، بەڵام باوکی سەرایا فەرمانی دەدا.

زوهەیری تێکشکاو بۆ کۆشکی کوڕی هوبەیرە گەڕایەوە و لەوێ نیشتەجێ بوو. حەسەن کوڕی سەهل، عەبدوس کوڕی باوکی خالیدی مەرورووزی لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بۆ جەنگی باوکی سەرایا ڕەوانە کرد. ئەو لەشەوی حەڤدەیەمی ڕەجەب/ یەکی مارس لەگەڵ گەڕەکی جامع ڕووبەرووی باوکی سەرایا بوویەوە و عەبدوس لەسەر دەستی باوکی سەرایا کوژرا. سوپاییەکانی عەبدوس هەموویان کوژران یا دیل کران.

تالبییەکان (منداڵەکانی ئەبوتالیب) لەناو سەرزەمینە ئیسلامییەکاندا بلاّو بوونەوە. باوکی سەرایا لەکوفە سکە و درهەم و دیناری لێدا و سوپاکەی خۆی بۆ بەسرە وکەنارەکان ڕەوانە کرد. عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عیسا کوڕی محەممەدی جەعفەری بۆ فەرمانڕەوایەتی بەسرە و حسەین کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی ناسراو بەئەفتەسی وەك فەرمانڕەوای کوفە دەستنیشان کرد. ئەفتەسی کردە سەرپەرەستی حاجییەکان. باوکی سەرایا، ئیبراهیم کوڕی موسا کوڕی جەعفەری بۆ یەمەن و ئیسماعیل کوڕی موسا کوڕی جەعفەری بۆ فارس و زەید کوڕی موسا کوڕی جەعفەری بۆ فەرمانڕەوایی ئەهواز دیاریکرد. زەید هێرشی کردەسەر بەسرە و دەستی بەسەردا گرت و عەباس کوڕی محەممەدی جەعفەری لەو شارە دەرپەڕاند و پەیوەستی ئەهوازی کرد. باوکی سەرایا، محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی داود کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی بۆ مەداین ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەرۆژهەلاّتەوە ڕوو بکاتە بەغداد. ئەو

ڕۆشتە مەداین و لەوێ ئوردوی لێدا و سوپایەکی بۆ دیالە ڕەوانە کرد.

عەبدوالله کوڕی سەعیدی حەرەشی بەنوێنەرایەتی حەسەن کوڕی سەهل، فەرمانڕەوای واست بوو. ئەوان لەهێرشی سوپاکەی باوکی سەرایا بۆ بەغداد هەڵاتن. حەسەن کاتێك بینی سوپاکەی ناتوانێت لەبەرابەر باوکی سەرایا خۆڕاگری بکات، کەسی بۆ لای هەرسیمە نارد و بۆ جەنگ دژی باوکی سەرایا داوای هاوکاری کرد بەڵام هەرسیمە چوونکە لەحەسەن توڕە بوو، ڕێگەی خوراسانی گرتبووە بەر. دوای ماوەیەك رازی بوو هێرش بکاتە سەر کوفە و لەشەعبان/مارس گەیشتە کوفە. حەسەن، عەلی کوڕی سەعیدی بۆ مەداین ڕەوانە کرد. ئەم هەواڵە لەکۆشکی هوبەیرە بەباوکی سەرایا گەیشت. سوپایەکی بۆ مەداین نارد. سوپاکەی ئەو لەمانگی رەمەزان/ ئاوریل ڕۆشتنە ناو مەداین. خۆی سوپایەکی رازاندەوە و تا رووباری سەرسەڕ پێشرەوی کرد. هەرسیمە لەبەرابەر ئەو سوپای ڕازاندەوە و تەنیا رووبار ئەم دوو سوپای لەیەك جیا دەکردەوە. عەلی کوڕی سەعید لەشەوال/ مەی رووی کردە مەداین. سوپاکەی باوکی سەرایا رووبەرووی بوونەوە بەڵام شکستیان خوارد و عەلی کوڕی سەعید دەستی بەسەر مەداییندا گرت. باوکی سەرایا ئاگادار بوویەوە و لەرووباری سەرسەڕ بەرەو کۆشکی هوبەیرە بەرێکەوت. هەرسیمە شوێنی کەوت و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەوی گرت و کوشتی و سەری ئەوانی بۆ حەسەن کوڕی سەهل نارد. هەرسیمە لەگەڵ باوکی سەرایا جەنگی و لەم جەنگەدا ژمارەیەك لەشەرکەرانی باوکی سەرایا کوژران. باوکی سەرایا رووی کردە کوفە. تالبییەکانی هاوڕێی ئەو هێرشیان کردە سەرماڵی عەباسییەکان و موالی و شوێنکەوتەکانیان و وێرانیان کرد و سامانەکانیان تاڵان و زەوییەکانیان سوتاند و لەکوفە دەریان کردن. کاری قێزەونی زۆریان ئەنجامدا و ئەمانەتەکانی خەڵکانیان ڕفاند.

هەرسیمە خەڵکانی ئاگادار کردەوە کەدەخوازێت حەج بکات. هەموو ئەو کەسانەی لەخوراسان و ناوچەکانی دیکەوە روویان دەکردە ماڵی خوا، دەیگرتن تاسەرکردایەتی حەج بگرێتەدەست. هەرسیمە، داود کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباسی ڕەوانەی

مەککە کرد و باوکی سەرایا حسەین کوڕی حەسەن ئەفتەس کوڕی عەلی کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی ڕەوانەی مەککە کرد و محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی داود کوڕی حەسەن کوڕی عەلی بۆ مەدینە نارد کەدوای ئەوەی ڕۆشتە ناو شارەکە، کەس شەڕی لەگەڵ نەکرد. کاتێك هەواڵی ڕەوانە کرانی حسەین کوڕی حەسەن لەلایەن باوکی سەرایا بۆ مەککە وەك سەرپەرەستی حاجییەکان بەداود کوڕی عیسا گەیشت، شوێنکەوتەکانی منداڵەکانی عەباس و موالییەکانی کۆکردەوە. مەسروری کەبیر لەو ساڵەدا لەگەڵ دوو سەد کەس ڕێگەی حەجی گرتبووە بەر. ئەو سوپاکەی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد وبەداوودی وت: تۆ یا یەکێك لەمنداڵەکانت ڕێز لەپەیمانەکەی خۆتان بگرن و من لەم جەنگەدا تۆم بەسە. داود وتی: جەنگ لەمانگی موحرەم بەڕەوا نازانم، سوێند بەخوا ئەگەر لەم ڕێگەوە بێن، لەڕێگەیەکی دیکەوە دەڕۆم (بۆ ئەوەی جەنگ ڕوونەدات)

داود لەکەنارەکانی موشاش بۆسەی نایەوە و ئەو دەستانەی کۆی کردبوویەوە، بلاوەیان لێکرد. مەسرور لەترسی ئەوەی ئەم جەنگە یەخەی بگرێت، دوای داود بۆ عێراق گەڕایەوە. خەڵکان مانەوە. پیاوێك لەناو خەڵکان بێ هیچ راوێژێك وەك پێشنوێژی ئەوان دیاریکرا و خەڵکان بێ ئیمان لەعەرەفەوە بەرێکەوتن.

حسەین کوڕی حەسەن لەشەرف بوو و لەڕۆشتنە ناو مەککە دەترسا تا ئەوەی دەستەیەك ئاگاداریان کردەوە منداڵەکانی عەباس کەسیان لەمەککە نەماوەتەوە. ئەو لەگەڵ دەکەس هاتە ناو شارەکە، بەدەوری ماڵی خوادا سوڕانەوە و سەفا و مەروەیان بڕی و لەشەودا روویان کردە عەرەفەت و دواتر گەڕانەوە بۆ موزدەلیفە و نوێژی بەیانی لەگەڵ خەڵکان خوێند و ڕۆژەکانی حەج لەمەنی مایەوە. تا کۆتایی ساڵ لەمەککە مایەوە. محەممەد کوڕی سلێمان لەمەککە مایەوە تا ساڵ کۆتایی پێهات.

هەرسیمە لەگوندی شاهی دابەزی و حاجییەکانی گەڕاندەوە. مەنسور کوڕی مەهدی بانگ کرد و نامەی بۆ سەرکردەکانی کوفە نووسی. عەلی کوڕی سەعید لەمەداینەوە رووی کردە واست و دەستی بەسەردا گرت. بەرەو بەسرە ئەسپی غاردا بەلاّم لەم ساڵەدا نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت.

## بەهێزبوونی نەسر کوڕی شەبەسی عوقەیلی

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی شەبەسی عوقەیلی لەجەزیرە بەهێز و ژمارەی سوپاییەکانی زیادی کرد. ئەو گەمارۆی خستە سەر شاری حەران و دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی منداڵەکانی تالیب لەدەوری کۆبوونەوە و پێیان وت: تۆ پیاوانی منداڵەکانی عەباس دەکوژیت و ئەوان چاوەڕوانی تۆڵەسەندنەوەن. تۆ ڕێگە نادەیت عەرەبەکان پەیوەستی ئەوان بن کەواتە ئەگەر بەیعەت لەگەڵ خەلیفە بکەیت، گونجاوترە. وتی: چ کەسێك و لەکام خەڵکە؟ وتیان: یەکێك لەمنداڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب. وتی: ئایا من لەگەڵ یەکێك لەمنداڵەکانی کەنیزی ڕەش بەیعەت بکەم تا بڵێت خواوەند منی ئافراندووە و ڕۆژی بۆ دیاری کردووم؟ وتیان: کەواتە لەگەڵ یەکێك لەئومەوییەکان بەیعەت بکە. وتی: ڕۆژگار پشتی تێکردوون و ئەو کەسەی ڕۆژگار پشتی تێ بکات، چیتر بەختەوەری ڕووی تێ ناکات، ئەگەر بەیعەت لەگەڵ ئەوان بکەم، بەدبەختی بەرۆکم دەگرێت. من خوازیاری پەیوەست بوون بەعەباسییەکانم و ئەگەر دژی ئەوان دەجەنگم لەبەر ئەوەیە ئەوان ناعەرەبەکان پێش عەرەبەکان دەخەن.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی موسعەب کوڕی زورەیق باوکی تاهیر کوڕی حسەین لەخوراسان مرد. لەم کاتەدا تاهیر لەڕەققە بوو. مەئمون لەرێ و ڕەسمی بەخاك سپاردنی ئەو بەشداری کرد. سەهل کوڕی فەزڵ ڕۆشتە ناو گۆڕەکەی.، مەئمون کەسی بۆ لای تاهیر نارد تا سەرەخۆشی لێ بکات.

لەم ساڵەدا باوکی عەون معاویە کوڕی ئەحمەدی سەمادحی موالی بنەماڵەی جەعفەر کوڕی ئەبو تالیب، خواپەرەستی مەغریبی مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا سەهل کوڕی شازویە باوکی هارون و عەبدوللە کوڕی نەمیری هەمەدانی کوفی بەنازناوی باوکی هاشم باوکی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی نەمیر مامۆستای بوخاری و موسلیم کوڕی موحەدیسی ناودار، لەناو دڵی خاکدا خەوتن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەدی کۆچی ( ٨١٥ زایینی )

### چۆنیەتی هەڵاتنی باوکی سەرایا

لەم ساڵەدا باوکی سەرایا و هاوەڵانی لەکوفە هەڵاتن چوونکە هەرسیمە دەوری ئەم شارەی گرتبوو. بەڕادەیەك بۆ جەنگی ئەوان پێداگری دەکرد کەباوکی سەرایا و هاوەڵانی بێزار بوون و سەربازەکانی دەستیان لەجەنگ هەڵگرت. باوکی سەرایا کاتێك ئەم بارودۆخەی بینی، بۆ ڕۆشتنەدەر لەکوفە خۆی ئامادە کرد. هاوڕێ لەگەڵ هەشسەد سوار و محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی زەید لەکوفە هاتەدەر. هەرسیمە ڕۆشتە ناو شارەکە و ئەمانی بەهەمووان بەخشی و زیانی لێ نەدان. هەڵاتنی باوکی سەرایا لەشانزەی موحەرەم/بیست و پێنجی ئوت بوو. ئەو ڕێگەی قادسییەی گرتەبەر و لەوێوە بەرەو شوشی خوراسان بەرێکەوت. لەرێگا ڕووبەرووی پارەیەکی زۆر بوویەوە کەلەخوراسانەوە بۆ ئەهوازیان دەبرد. دەستی بەسەر پارەکەدا گرت و لەناو هاوەڵانیدا دابەشی کرد.

لەوێ حەسەم کوڕی عەلی مەئمونی ڕۆشتە لای و داوای لێکرد لەسنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو بڕواتەدەر. مەئمونی نەیدەویست لەگەڵ ئەو بجەنگێت بەلام باوکی سەرایا بڕیاری جەنگی دابوو. مەئمونی ڕووبەڕووی بوویەوە و شکستی پێهێنا و برینداری کرد و هاوەڵانی بلاوەیان پێکرا. باوکی سەرایا لەگەڵ محەممەد کوڕی محەممەد و باوکی شوك بەرەو ماڵەکەی خۆی لەرەئس عەین بەرێکەوتن بەلام کاتێك گەیشتنە جەلەولا، حیمادی کەنغوش بەسەریاندا زاڵ بوو، هەمووانی گرت و بەرەو بارەگای حەسەن کوڕی سەهل لەنەهرەوان ڕەوانەی کردن. حەسەن باوکی سەرایای کوشت وسەری ئەوی بۆ مەئمون نارد و جەستەی بێ سەری لەسەر پردی بەغداد هەڵواسی و محەممەد کوڕی محەممەدی ڕەوانەی بارەگای مەئمون کرد.

هەرسیمە ڕۆژێك لەکوفە مایەوە و گەڕایەوە و غەسان کوڕی باوکی فەرەج باوکی ئیبراهیم کوڕی غەسانی وەك فەرمانداری ئەو شارە هەڵبژارد. ئەو فەرمانەدەی پاسەوانەکان و فەرمانڕەوای خوراسان بوو. عەلی کوڕی سەعید ڕووی کردە بەسرە

و لەعەلەوییەکان پاکی کردەوە. ئەم شارە لەژێر فەرمانی زەید کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. ئەوکەسەیە بەزەید ئەلنار ناو دەبرێت. هۆکاری ئەم ناولێنانە ئەوە بوو چەندین ماڵی عەباسییەکان و شوێنکەوتەکانی ئەوانی لەبەسرە سوتاند. هەرکات کەسێك بەجل و بەرگی ڕەش (نیشانەی عەباسییەکان) دەڕۆشتە لای، ئاگری تێبەردەدا.. جگە لەسامانی منداڵەکانی عەباس، سامانێکی زۆری لەبازرگانەکان سەند. کاتێك عەلی گەیشتە بەسرە، زەید داوای ئەمانی کرد. عەلی ئەمانی پێدا و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. ئەو سوپایەکی بۆ مەککە و مەدینە و یەمەن ڕەوانە کرد و فەرمانی جەنگ لەگەڵ عەلەوییەکانی پێدان. شۆڕشی باوکی سەرایا تا کوژرانی، دە مانگی خایاند.

## شۆڕشی ئیبراهیم کوڕی موسا کوڕی جەعفەر

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد لەمەککە شۆڕشی کرد. کاتێك لەکارەکانی باوکی سەرایا ئاگادار بوویەوە، ڕووی کردە یەمەن. کارگوزاری ئەم شارە ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس لەلایەن مەئمونەوە بوو. کاتێك بیستی ئیبراهیم لەسەنعا نزیك بۆتەوە، ڕێگەی مەککەی گرتەبەر و گەیشتە موشاش و لەوێ ئوردووی لێدا. لەوێ دەستەیەك لەخەڵکانی مەککە کە لەعەلەوییەکان هەڵاتبوون، لەدەوری کۆبوونەوە و ئیبراهیم دەستی بەسەر یەمەندا گرت. ئەویان بەجەزار (قەساب) ناو دەبرد چوونکە ژمارەیەکی زۆری لەیەمەن کوشت و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد و سامانەکانی بەتاڵانی برد.

## هەڵس وکەوتی حسەین کوڕی حەسەن ئەفتەس لەمەککە و وەرگرتنی بەیعەت بۆ محەممەد کوڕی جەعفەر

لەموحەرەمی ئەم ساڵە/ئوتی ٨١٥ زایینی، حسەین پەردەی کەعبەی لێکردەوە و پەردەیەکی دیکەی پێوەهەڵواسی کەباوکی سەرایا لەکوفەوە ناردبووی. ئەم

پەردە لەهەوریشم بوو.

حسیەن ئەمانەتییەکانی منالەکانی عەباس و شوێنکەوتەکانی ئەوانی ناسییەوە و دەستی بەسەردا گرت. سامانی خەڵکی بەبیانوی ئەوەی کەئەمانەتی شوێنکەوتەکانی منالەکانی عەباسییە، زەوت کرد و خەڵکان لەدەستی هەڵدەهاتن. هاوەڵانی حسەین پەنجێرەکانی حەرەمیان هەڵکەند و سەر ستوونە زێرینەکانیان فڕاند. حسەین هەموو گەنجی سوچی حەرەمی دەرهێنا و ڕفاندی و لەگەڵ پەردەی کەعبە لەناو هاوەڵانیدا دابەشی کرد.

کاتێك لەکوڕانی باوکی سەرایا ئاگادار بوویەوە و بێزاری خەڵکی لەکردەوەکانی خۆی بینی، لەگەڵ هاوەڵانی هاتە لای محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی. ئەو پیرەپیاوێکی بەتەمەن و کەسێکی ڕێزدار لای خەڵکان بوو کە بەهۆی خراپەکاری کەسانی بنەماڵەکەی بەردەوام خۆی لەوان بەدوور دەگرت. ئەو زانستی لەجەعفەری باوکییەوە پێبڕابوو و خەڵکان گوێیان لەوتەکانی دەگرت. کەسێکی خۆپارێز بوو. حسەین و هاوەڵانی هاتنە لای و وتیان: تۆ خۆت پێگەی خۆت لەناو خەڵکان دەزانی، ئەگەر لەگەڵ تۆ بەیعەت بکەین، کەس دژایەتی ئێمە ناکات.

محەممەد کوڕی جەعفەر رازی نەبوو کوڕەکەی، عەلی، و حسەین کوڕی حەسەنی ئەفتەس بەرادەیەك پێداگرییان کرد کەوەلامی رازی بوونی دانەوە. ئەوان لەرەبیع الاول/ئۆکتۆبەر هاوشێوەی خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ کرد. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و خوازراو و نەخوازراو بەیعەتیان بەست و بەسەروەری باوەڕداران ناویان برد. چەند مانگێك خەلیفە بوو بێ ئەوەی فەرمانەکانی هیچ کاریگەرییکیان هەبێت. عەلی کوڕی و حسەین کوڕی حەسەن خراپترین شێوازیان گرتەبەر و قێزەونترین کارەکانیان ئەنجامدا. حسەین کوڕی حەسەن ژنێکی جوان لەمنالەکانی فێهری گرت و داوای جووت بوونی لێکرد بەلام ژنەکە رازی نەبوو. حسەین مێردی ژنەکە لەمنالەکانی مەخزومی بەشێوەیەك ترساند کەپیاوەکە خۆی شاردەوە. حسەین دەرگای ماڵی پیاوەکەی شکاند و ژنەکەی برد و بۆ ماوەیەك چێژی لێ وەرگرت تا ئەوەی ژنەکە هەلات.

عەلی کوڕی محەممەد کوڕی جەعفەر (کەباوکی وەك سەروەری باوەڕداران بەیعەتی لەگەڵ کرابوو) دەستی بەسەر مێردمنداڵێکدا گرت. ئەو کوڕی قازی مەککە بوو بەناوی ئیسحاق کوڕی محەممەد. کوڕێکی جوان بوو. عەلی بەزۆر بردی (بەرۆژی رووناك لەبەرچاوی خەڵك بردی و دەستدرێژی کردەسەر) کاتێك خەڵکانی مەککە و دراوسێکانیان ئەمەیان بینی، لەحەرەم کۆبوونەوە و ژمارەیەکی زۆر پەیوەستیان بوون و ڕۆشتنە لای محەممەد کوڕی جەعفەر و پێیان وت: یا لەسەر کار لات دەبەین یا خوێنت دەرێژین مەگەر ئەوەی ئەو کوڕە گەنجە بگەڕێنیتەوە. ئەو دەرگای ماڵەکەی بەسەر ئەواندا بەست و لەپەنجێرەوە قسەی لەگەڵ کردن. داوای ئەمانی کرد تا سوار ئەسپەکەی خۆی بێت و منداڵەکە بگەڕێنێتەوە. سوێندی خوارد ئاگای لەم رووداوە نییە. ئەمانیان پێدا. ڕۆشتە لای عەلی کوڕی و منداڵەکەی لێسەندەوە و گەڕاندییەوە بۆ بنەماڵەکەی.

ماوەیەك دواتر ئیسحاق کوڕی موسای عەباسی لەیەمەنەوە هات و لەموشاش خێوەتی هەڵدا. تالبییەکان ڕۆشتنە لای محەممەد کوڕی جەعفەر و ئاگاداریان کردەوە. خەندەکیان بەدەوری خۆیان هەڵکەند و خەڵکان و بیابان نشینەکان وکەسانی دیکە لەدەوری محەممەد کوڕی جەعفەر کۆبوونەوە. ئیسحاق سەرەتا مەبەستی جەنگی کرد بەڵام دواتر لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە و جەنگی پشتگوێ خست و رووی کردە عێراق. لەرێگە رووبەرووی سوپایەك بوویەوە کەهەرسیمە بۆ مەککە ڕەوانەی کردبوو. جەلەودی و رەجا کوڕی جەمیل هاورێیەتی ئەم سوپایان دەکرد. بەئیسحاقیان وت: لەگەڵمان بگەڕێرەوە چوونکە لەم جەنگەدا ئێمەت بەسە. ئیسحاق لەگەڵیان گەڕایەوە. شەڕیان لەگەڵ تالبییەکان کرد و شکستیان پێهێنان. محەممەد کوڕی جەعفەر کەسی نارد و داوای ئەمانی کرد. ئەمانیان پێ بەخشی. بەمشێوەیە عەباسییەکان لەجومادی الاخر/ژانویە هاتنە ناو مەککە و تالبییەکان مەککەیان بەجێهێشت.

محەممەد کوڕی جەعفەر رێگەی جوحفەی گرتەبەر بەڵام کۆیلەیەکی عەباسی خۆی پێگەیاند و سامانەکەی تالآن کرد. تەنیا چەند درهەمێکی بۆ هێشتەوە تا پێی بگاتە شوێنێك. ئەو رێگەی جۆهەینەی گرتەبەر و لەوێ دەستەیەکی

کۆکردەوە و ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر. لەگەڵ هارون کوڕی موسەییب فەرماندارى مەدینە جەنگا بەڵام شکستی خوارد و بەهۆی تیرێك یەکیك لەچاوەکانی دەرتۆقی و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران. محەممەد بەناچار بۆ ئوردووگاکەی خۆی گەڕایەوە.

دوای تەواو بوونی ڕێ و ڕەسمی حەج، داوای ئەمانی لەجەلەودی و ڕەجا کوڕی جەمیل کرد کەکوڕە مامی فەزڵ کوڕی سەهل بوو. ئەمانیان پێدا و ڕەجا بەنوێنەرایەتی مەئمون و فەزڵ کوڕی سەهل بەڵێنیدا ڕێز لەئەمانەکەی بگرن. محەممەد ڕازی بوو و لەبیست زیحەججە/ یانزەی ئاوریل هاتە مەککە، وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: لەمەرگی مەئمون ئاگادار بوومەوە، قورسایی بەیعەتی ئەوم لەسەر شان بوو، ئەم ئاژاوە گشتییە داوێنی منیشی گرت و خەڵکان وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ من کرد بەڵام دواتر زانیم مەئمون زیندووە بێ هیچ زیانێك. بۆ وەرگرتنی ئەم بەیعەتە داوای بەخشین لەخواوەند دەکەم و خۆم لەو بەیعەتەی بەمنتان داوە، بەدوور دەگرم و هاوشێوەی ئەم ئەنگوستیلە، لەپەنجەی خۆم دەریدەهێنم. بەیعەتی من لەسەر شانی هیچ کام لەئێوە نییە و دواتر لەسەر مینبەر هاتەخوار. ئەو لەساڵی ٢٠١/٨١٦ زایینی ڕێگەی عێراقی گرتەبەر و حسەن کوڕی سەهل ئەوی بۆ لای مەئمون نارد. کاتێك مەئمون بۆ عێراق گەڕایەوە، ئەوی لەگەڵ خۆی برد و محەممەد لەجەرجان مرد. بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین.

## کردەوەکانی ئیبراهیم کوڕی موسا

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی موسا کوڕی جەعفەر لەیەمەن پیاوێکی لەمناڵەکانی عەقیل کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ سوپایەك بۆ ئەنجامدانی ڕێ و ڕەسمی حەج لەگەڵ خەڵکان ڕەوانەی مەککە کرد. عەقیل هات و گەیشتە بێستانی مناڵەکانی عامر. ئاگاداریان کردەوە کەباوکی ئیسحاق موعتەسەم لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان مەبەستی حەج کردنیان هەیە و حەمدویە کوڕی عەلی کوڕی عیسا لەناویاندا دەبینرێت. حەسەن کوڕی سەهل، حەمدویەی وەك فەرمانڕەوای یەمەن دیاریکردبوو. عەقیلی زانی ناتوانێت بەرگەی جەنگ لەگەڵ ئەوان بگرێت و لەبەر

ئەمە لەبێستانی منداڵەکانی عامر مایەوە. کاروانێك کەپەردە و بۆنی خۆشی کەعبەی بارکردبوو، لەوێوە تێپەڕی. عەقیلی هەموو سامانی کاروانەکەی فڕاند و حاجییە تاڵان کراوەکان، بێ هیچ سامانێك ڕۆشتنە ناو مەککە.

موعتەسەم لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد. جەلودی وتی: من تۆ لەجەنگی ئەوان بێ نیاز دەکەم. سەد سواری هەڵبژارد و لەگەڵ ئەوان رووی کردە سوپاکەی عەقیلی. لەبەرەبەیاندا گەیشت و بێ وەستان جەنگی دەستپێکرد. پرژوبلاوەی بەسوپاکەی ئەوان کرد و ژمارەیەکی زۆری لێ ئەسیر کردن. پەردەی کەعبەی وەرگرتەوە و یەکی دە قامچی لەئەسیرەکاندا. دواتر ئازادی کردن و گەڕانەوە بۆ یەمەن بەبێ توێشو بەشێوەیەك لەرێگە سواڵیان دەکرد و زۆربەیان مردن.

## ڕۆشتنی هەرسیمە بۆ لای مەئمون و کوژرانی ئەو

کاتێك هەرسیمە لەجەنگ دژی باوکی سەرایا ئاسوودە بوو، نەڕۆشتە لای حەسەن کوڕی سەهل لەمەداین و لەرێگەی عەقرقوف و بەرەدان و نەهرەوان رێگەی خوراسانی گرتەبەر. فەرمانی مەئمون بۆ ڕۆشتن بۆ شام و حیجاز لەشوێنێك بەهەرسیمە گەیشت کەچیتر نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. وتی: تاچاوم بەسەروەری باوەڕداران نەکەوێت، ناگەڕێمەوە. لەوێوە کەخێرخوازی مەئمون و باوکی ئەو بوو و مەئمون ئەمەی بەباشی دەزانی، نەدەترسا. لەلایەکی دیکە هەرسیمە بڕیاریدا بوو مەئمون ئاگادار بکاتەوە لەوەی فەزڵ کوڕی سەهل بەشێك لەرووداوەکان لەو دەشارێتەوە و ئەوەی کە واز لەمەئمون ناهێنێت تا بۆ بەغدادی دەگەڕێنێتەوە (بۆ ئەوەی لەنزیکەوە کاروبارەکانی لەژێر دەستا بێت). فەزڵ لەمەبەستەکەی هەرسیمە ئاگادار بوویەوە و بەمەئمونی وت: هەرسیمە شارەکان و خەڵکانی دژی تۆ هانداوە و لەگەڵ باوکی سەرایا بەشێوەیەکی نهێنی رێککەوتووە و ئەگەر داوای هەرسیمە نەدەبوو، باوکی سەرایا شۆڕشی نەدەکرد. سەروەری باوەڕداران چەندین نامەی بۆ نووسیوە تا بۆ شام و حیجاز بگەڕێتەوە بەڵام نەك ئەو کارەی نەکرد بەڵکو بەشێوەیەکی توندوتیژ قسە دەکات و ئەگەر بەمشێوەیە پشتگوێ بخرێت، کەسانی دیکەیش هان دەدات.

بەمشێوەیە مەئمون دڵی لەهەرسیمە ڕەش کرد. هەرسیمە لەسەرخۆ ڕێگەی بڕی و لەمانگی زیقەعدە/ ژوئەن گەیشتە مەرو. لەوەی هاتنەکەی لەمەئمون بشارێتەوە، ترسا و لەبەر ئەمە فەرمانیدا تەپڵی گەڕانەوە لێ بدەن تا مەئمون دەنگەکەی ببیستێت. مەئمون دەنگی تەپڵەکەی بیست و وتی: ئەم دەنگە چییە؟ وتیان: هەرسیمەیە و بەرەو ئێرە دێت. هەرسیمە گومانی دەکرد مەئمون بەوتەکانی رازی دەبێت. مەئمون مۆڵەتی ڕۆشتنە لای پێدا. کاتێك هەرسیمە ڕۆشتە بارەگاکەی، مەئمون پێی وت: ئێستا لایەنگیری لەعەلەوییەکانی کوفە دەکەیت و باوکی سەرایا بۆ شۆڕش هان دەدەیت. تۆ ئەگەر دەتویست، دەتتوانی هەموویان بگریت و لەناویان ببەیت.

هەرسیمە ویستی وەڵام بداتەوە و داوای بەخشین بکات بەڵام مەئمون رازی نەبوو. فەرمانیدا قامچی بارانی بکەن بەشێوەیەك لووتی شکا و فڕیاندایەدەر. فەزڵ فەرمانیدا بوو لەزیندان ئەشکەنجەی بکەن. ئەویان زیندانی کرد و چەند ڕۆژێك مایەوە. فەزڵ کەسی نارد و کوشتی و دواتر وتیان لەزینداندا مردووە.

## شۆڕشی حەربییە لەبەغداد

لەم ساڵەدا حەربییە (دەستەیەك لەسوپاییەکان) دژی حەسەن کوڕی سەهڵ شۆڕشیان کرد. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتی ڕۆشتنی هەرسیمە بۆ لای مەئمون، حەسەن کوڕی سەهل لەمەداین بوو. حەسەن پەیکی بەدوای عەلی کوڕی هوشام نارد مژدەی مانگانە بەحەربییە بدە بەڵام دوای بخە و لەدانی خۆت بەدوور بگرە. هوشام بەنوێنەرایەتی حەسەن کارگوزاری بەغداد بوو.

حەربییە پێشتر کاتێك هەرسیمە ڕێگەی خوراسانی گرتبووە بەر، شۆڕشیان کرد و وتیان: رازی نابین تا ئەو کاتەی حەسەن کوڕی سەهل و کارگوزارەکانی ئەو لەبەغداد دوور بخەینەوە. ئەوان کارگوزارەکانی حەسەنیان دەرکرد و ئیسحاق کوڕی موسای هادییان وەك فەرمانڕەوایی خۆیان هەڵبژارد و خەڵکانی هەردوو لای دیجلە ڕەزامەندی خۆیان نیشاندا. حەسەن ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و بەشێوەیەکی نهێنی نامەی بۆ سەرکردەکانیان نووسی تا لەلای عەسکەری

مەهدییەوە بێن. حەربییە لێکۆڵینەوەیان لەکارەکەی خۆیان کرد و ئیسحاق (فەرمانڕەوای تازە هەڵبژێردراویان) لەگەڵ خۆیان برد و لەروجەیل دایاننا.

زوهەیر کوڕی موسەییب لەگەڵ هێزەکانی لەعەسکەری مەهدی خێوەتی لێدا. حەسەن کوڕی سەهل عەلی کوڕی هوشامی ڕەوانە کرد تا لەقۆلێکی دیکەوە بێت. دواتر ئەو و محەممەد کوڕی باوکی خالید لەشەوێك لەشەوەکانی شەعبان/ مارس هاتنە ناو بەغداد و لەسەر پردی سەرات بۆ ماوەی سێ شەو و ڕۆژ شەڕیان لەگەڵ حەربییە کرد. دواتر عەلی کوڕی هوشام بەنوێنەرایەتی حەسەن کوڕی سەهل مژدەی پێدان ئەگەر سامانیان بەدەست بگات، مانگانەی شەش مانگیان پێ دەدەن. حەربییە رازی بوون و داوایان کرد پێشتر هەرکام یەکی پەنجا درهەم وەربگرن تا بۆ ڕەمەزان/مارس، خەرجی بکەن. عەلی کوڕی هوشام رازی بوو. ئەو دانی پارەکەی دەستپێکرد بەڵام هێشتا پارەی بەکەس نەدابوو ئاگادار بوویەوە زەید کوڕی موسا ناسراو بەزەید ئەلنار لەزیندانی بەسرە هەڵاتووە. زیندانبانی ئەو عەلی کوڕی سەعید بوو. ئەو لەمانگی زیقەعدەی ساڵی دووسەد/ژوئەن لەگەڵ براکەی باوکی سەرایا لەکەنارەکانی ئەنبار ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. عەلی کوڕی هوشام دوای یەك حەفتە هەڵات و لەسەرسەرڕ دابەزی چوونکە نەیتوانی بوو بەحەربییە پەنجا درهەمەکە بدات تا ئەوەی جەژنی قوربان هات و حەربییە لەسەرئەنجامی هەرسیمە ئاگادار بوونەوە. حەربییە هێرشیان کردەسەر عەلی کوڕی هوشام و ئەویان دوورخستەوە.

جێگری هەرسیمە لەبەغداد، محەممەد کوڕی باوکی خالید بوو. عەلی کوڕی هوشام بەردەوام ئەوی ریسوا دەکرد. ئەو کینەی عەلی لەدڵدا بوو لەبەر ئەمە پەیوەستی حەربییە بوو. بەپەیوەست بوونی ئەو عەلی کوڕی هوشام توانای بەرگری لەدەستدا و بۆ سەرسەرڕ هەڵات.

دەڵێن: هۆکاری شۆڕشی حەربییە ئەوە بوو حەسەن کوڕی سەهل، عەبدوالله کوڕی عەلی کوڕی ماهانی قامچی باران کرد و بەم پێیە ئەبنا(مناڵی ئێرانییەکان) کینەی ئەویان لەدڵ گرت و دەریانپەڕاند.

## شۆڕشی موسڵ

لەم ساڵەدا شۆڕشی موسڵ لەنێوان منالەکانی سامە و منالەکانی سەعلەبە دەستی پێکرد. منالەکانی سەعلەبە پەنایان بۆ محەممەد کوڕی حسەینی هەمەدانی برای عەلی کوڕی حسەین و فەرمانداری شارەکە برد. فەرمانی پێدان بۆ دەرەوەی شارەکە کۆچ بکەن. ئەوان لەشارەکە ڕۆشتنەدەر. منالەکانی سامە لەگەڵ هەزار سوار شوێنیان کەوتن تا گەیشتنە عەوجا و لەوێ گەمارۆیان خستنە سەر. عەلی و محەممەد دوو کوڕەکەی حسەین ئاگادار بووینەوە و ئەو دووانە بۆ هاوکاری منالەکانی سەعلەبە، هێزێکیان بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد. شەڕێکی قورس ڕوویدا و دەستەیەك لەمنالەکانی سامە لەخوێنی خۆیاندا گەوزان و ژمارەیەکیان ئەسیر کران. ئەسیرەکان کەمنالەکانی تەغلەبیش لەناویاندا دەبینران، لەشارەکە زیندانی کران.

دوای ئەمە ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی خەتابی عەدەوی تەغلەبی هاتە لای محەممەد و خوازیاری ئاشتی بوو. محەممەد رازی بوو و بەمشێوەیە بارودۆخی شارەکە هێور بوویەوە و شۆڕش دامرکایەوە.

## جەنگ لەگەڵ فەرەنگییەکان

لەم ساڵەدا حەکەم، پاشای ئاندۆلۆس، سوپایەکی بەفەرماندەیی عەبدولکەریم کوڕی موغیس رازاندەوە تا هێرش بکەنە سەر سەرزەمینی فەرەنگییەکانی ئاندۆلۆس. سوپاکەی ئەو پێشڕەوی کرد و گەیشتە ناوەڕاستی سەرزەمینی ئەوان. سوپای حەکەم ئاوەدانییەکانیان وێران کرد و ئەوەی دەستیان کەوت، فڕاندییان و چەندین قەلأیان خاپور کرد. دەگەیشتنە هەر شارێك، دەیانگرت و درێژەیان بەرێگەی خۆیان دەدا تا دەگەشتنە شارێکی دیکە. بەمشێوەیە هەموو گەنجینەی پاشاکانی ئەوانیان خاڵی کرد.

کاتێك پاشای فەرەنگ ئەم کردەوەی موسوڵمانانی بینی، نامەی بۆ هەموو پاشاکانی ئەودەوروبەرە نووسی و داوای هاوکاری لێکردن. مەسیحییەکان

لەهەرلایەك بۆ هاوكاری ئەو بەرێكەوتن. ئەو بەسوپایەكی گەورە لەبەرابەر موسوڵمانان سوپای رازاندەوە. تەنیا یەك رووبار لەنێوان ئەواندا بوو. شەڕێكی قورس لەنێوانیان دەستی پێكرد و چەندین رۆژی خایاند. موسوڵمانان بڕیاریاندا بوو لەرووبارەكە بپەڕنەوە بەڵام ئەوان رێگەیان لێدەگرتن. كاتێك موسوڵمانان ئەم بارودۆخەیان بینی، لەرووبارەكە پاشەكشێیان كرد. مەسیحییەكان بۆ جەنگی موسوڵمانان لەرووبارەكە پەڕینەوە و جەنگێكی قورس دەستپێكرد بەڵام مەسیحییەكان بەناچاری بۆ لای رووبارەكە گەڕانەوە. موسوڵمانان ژمارەیەكی زۆر لەوانیان كوشت و ئەسیریان كردن. هەركەس لەرووبارەكە پەڕییەوە، گیانی دەرباز كرد. دەستەیەك لەفەرماندە و پاشاكانی ئەوان گرفتار بوون و فەرەنگییەكان لای رووبارەكە خۆڕاگرییان كرد و رێگەیان نەدا موسوڵمانان لەرووبارەكە بپەڕنەوە. سیانزە رۆژ بەمشێوەیە تێپەڕی. هەموو رۆژێك جەنگ بەردەوام و جۆگەلەی خوێن دروست دەبوو تا ئەوەی باران باری و ئاوی رووبارەكە زیادی كرد و پەڕینەوە لەرووبار ئەگەری نەبوو. بەم شێوەیە عەبدولكەریم لەحەوتی زیحەججە/ بیست و نۆی مارس گۆڕەپانی بەجێهێشت و گەڕایەوە.

## شۆڕشی بەربەرییەكان لەكەنارەكانی موروور

لەم ساڵەدا پیاوێك لەبەربەرییەكان لەكەنارەكانی موروور لەئاندۆلۆس هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك ئاڵای شۆڕشی بەرز كردەوە. هەواڵی كارگوزاری ئەم كەنارە، لەنامەیەك بەدەستی حەكەم گەیشت، بەڵام حەكەم نووسراوەكەی شاردەوە و هەمان سات یەكێك لەفەرماندەكانی خۆی بانگ كرد و بەشێوەیەكی نهێنی ئاگاداری كردەوە و پێی وت: هەر ئێستا بۆ جەنگی ئەو خارجییە بەرێكەوە و سەری بۆ من بێنە، ئەگەر سەری ئەو نەخەیتە بەرپێی من، سەری تۆ دەخەمە جێگەكەی. لێرە دانیشتووم و چاوەڕوانی هاتنی تۆ دەكەم.

ئەو فەرماندە بۆ جەنگی ئەو پیاوە بەرێكەوت و بەوشیاری زۆر سەبارەت بەو پرسیاری كرد و بەدوای شوێنەكەیدا گەڕا، ئەوسات ئەم قسەی حەكەمی بیركەوتەوە كە: ئەگەر سەری ئەو نەخەیتە بەرپێی من، سەری تۆ لەجێگەی ئەو

دادەنێم. بڕیاریدا هەموو هەوڵەکانی خۆی بخاتەگەڕ. بیری لەفێڵێك کردەوە وخۆی گەیاندە ئەو پیاوە خارجییە. ئەوی کوشت و سەری بڕی و بردییە لای حەکەم. بینی بەهەمان شێوە لەشوێنەکەی خۆی دانیشتووە. ڕۆشتن و گەڕانەوەی ئەو چل ڕۆژی خایاند. کاتێك حەکەم سەری بڕاوی ئەو پیاوەی بینی، ڕێزی لەفەرماندەکەی گرت و دیاری پێبەخشی و پێگەی بەرز کردەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەئمون، ڕەجا کوڕی باوکی زوحاکی ڕەوانە کرد تا عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد بێنێتە لای.

لەم ساڵەدا سەرژمێری منداڵەکانی عەباسییان کرد. ژمارەی ئەوان لەژن و پیاو دەگەیشتە سی و سێ هەزار کەس.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان پاشاکەی خۆیان دوای حەوت ساڵ و شەش مانگ فەرمانڕەوایەتی کوشت و میخائیل کوڕی جورجیسیان بۆ دووەم جار لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشاند.

هەروەها لەم ساڵەدا عەلی کوڕی باوکی سەعید ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ حەسەن کوڕی سەهل دەست پێکرد و مەئمون، سەراجی خزمەتکاری بۆ لای ئەو نارد و پەیامیدا: یا دەست دەخەیتە دەستی حەسەن کوڕی سەهل، یا بەرەو بارەگای مەئمون لەمەرو بەرێکەوە یا سەراج سەرت دەبڕێت. سەراج ڕۆشتە لای و عەلی کوڕی باوکی سەعید ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکان نیشاندا و لەگەڵ هەرسیمە هاتە لای مەئمون لەمەرو.

لەم ساڵەدا مەئمون، یەحیا کوڕی عامر کوڕی ئیسماعیلی کوشت چوونکە مەئمونی بەسەروەری ناباوەڕان (امیر الکافرین) ناو دەبرد.

موعتەسەم ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی بەختەری وەهب کوڕی وەهبی قازی و مەعروف کەخری و سەفوان کوڕی عیسای فەقیە و مەعافی کوڕی داودی موسڵی فرەزان، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد ویەکی کۆچی ( ٨١٦ زایینی )

## فەرمانڕەوایی مەنسور کوڕی مەهدی لەبەغداد

لەم ساڵەدا خەڵکانی بەغداد مەبەستی ئەوەیان کرد لەگەڵ مەنسور کوڕی مەهدی (مامی مەئمون) وەك خەلیفە بەیعەت ببەستن بەڵام ئەو ڕازی نەبوو. داوایان لێکرد فەرمانڕەوایی ئەوان بگرێتەدەست و پێشنیاری بەیعەتی مەئمون بەخەڵکان بکات و ڕازی بوو.

هۆکاری ئەم کارە - وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا - ئەوە بوو خەڵکانی بەغداد عەلی کوڕی هوشامیان لەم شارە دەرکرد و کاتێك هەواڵی دەرکرانی عەلی کوڕی هوشام بەحەسەن کوڕی سەهل گەیشت، لەمەداینەوە ڕێگەی واستی گرتەبەر. ئەم ڕووداوە لەساڵی ٢٠١/ ٨١٦ زایینی ڕوویدا. کاتێك حەسەن بۆ واست هەڵات، محەممەد کوڕی باوکی خالید کوڕی هیندوان کەدژایەتی ئەوی دەکرد و فەرماندەیی ناسازگارانی ئەوی گرتبووە دەست، شوێنی کەوت.

سەعید کوڕی حەسەن کوڕی قەحتەبە فەرمانڕەوایی کەنارەکانی ڕۆژئاوایی بەغدادی لەدەستا بوو، نەسر کوڕی حەمزە کوڕی مالك فەرمانڕەوایی کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی گرتەدەست. مەنسور کوڕی مەهدی کەفەرمانڕەوایی بەغدادی کرد هاوڕێی لەگەڵ فەزڵ کوڕی ڕەبیع و خوزەیمە کوڕی خازم لەبەغداد بوو. لەم ڕۆژانەدا محەممەد کوڕی باوکی خالید لەلای تاهیر، لەڕەققەوە گەیشت و لەجەنگ لەگەڵ حەسەن کوڕی سەهل، لەگەڵ باوکی خۆی پەیمانی بەست و لەگەڵ هاوڕێیانی ئەو ڕێگەی واستی گرتبەر تا گەیشتنە گوندی ئەبو فورسەن لەنزیکی واست. کاتێك محەممەد گەیشتە دێری عاقول، سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە. زوهەیر کوڕی موسەییب کارگوزاری حەسەن لەجوخی لەئیسکاف مناڵەکانی جونەید مابوویەوە و نامەی بۆ فەرماندەکانی بەغداد دەنووسی بەڵام محەممەد لەناکاو هێرشی کردەسەر و ئەوی دیل کرد و دەستی بەسەر هەموو سامانەکەیادا گرت و ڕەوانەی بەغدادی کرد و لای باوکی، جەعفەر، زیندانی کرد. دواتر ڕێگەی واستی

گرتەبەر وکوڕەکەی هارونی لەدێری عاقول (لەجەزیرە لەنێوان دوو رووباری دیجلە و فورات) ڕەوانە کرد کەراوێژکاری حەسەن لەوێ فەرمانڕەوایەتی دەکرد. هارون شکستی پێهێنا و تا کوفە شوێنی کەوت.

تێکشکاوەکان لەکوفە لای حەسەن هاتنە واست و هارون کە بەسەر نیلدا زاڵببوو، بۆ لای باوکی گەڕایەوە و محەممەد هاورێ لەگەڵ هارون ڕێگەی واستیان گرتەبەر. حەسەن لەبەسرە گەڕایەوە و لەولای بەسرە ئوردووی لێدا.

وەك ئاماژەی پێدرا، فەزڵ کوڕی رەبیع کە تا ئەو رۆژە خۆی حەشاردابوو، کاتێك بینی محەممەد گەیشتۆتە واست، داوای ئەمانی کرد و محەممەد ئەمانی پێ بەخشی. بەمشێوەیە فەزڵ خۆی ئاشکرا کرد و محەممەد لەگەڵ سوپایەکی ئامادە و تەیار بۆ جەنگی محەممەد بەرێکەوت. شەڕێکی قورس دەستپێیکرد و لەئێوارێی ئەو رۆژە سوپاکەی محەممەد شکستی خوارد. محەممەد خۆڕاگری کرد و چەندین برینی قورسی بەرکەوت. هاوەڵانی ئەو بەشێوەیەکی قێزەون هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا و سامانەکانیان تالآن کرا. ئەم رووداوە لەبیست و سێی رەبیع الاوەل/نۆزدەی ئۆکتۆبەر بوو.

محەممەد لەفەم ئەلسولح دابەزی و حەسەن بۆ لای ئەوان ئەسپی غاردا و دووبارە ئاگری جەنگ هەڵگیرسا. کاتێك تاریکی شەو دەستی پێکرد، محەممەد و هاوەڵانی هەڵاتن و لەمونازل دابەزین بەلأم دووبارە حەسەن خۆی پێگەیاندن و ئاگری شەڕێکی دیکەیان خۆش کرد و بۆ شەوەکەی. محەممەد و هاوەڵانی خۆیان گەیاندە جوبەل و لەوێ مانەوە. محەممەد عیسای کوڕی بۆ عوریانا نارد و ئەو لەوێ مایەوە و محەممەد لەجەرجەرایا نیشتەجێ بوو. لەم کاتەدا برینەکانی محەممەد دەمی کردەوە و کوڕەکەی باوکی زەنبیل لەبیست و چواری رەبیع الاول/ سی ئۆکتۆبەر ئەوی بردە بەغداد و بۆ سوپاکەی چەندین سەرداری وەك جێگر دیاریکرد.. محەممەد کوڕی باوکی خالید مرد و بەشێوەیەکی نهێنی لەماڵەکەی بەخاك سپێردرا.

باوکی زەنبیل ڕۆشتە لای خوزەیمە کوڕی خازم و لەدواهاتی شومی باوکی ئاگاداری کردەوە. خوزەیمە خەڵکی لەمەرگی محەممەد ئاگادار کردەوە و نامەی

عیسا کوڕی محەممەدی خوێندەوە. لەم نامەدا داوای کردبوو کاروباری جەنگ بەڕێوە ببات. خەڵکان رازی بوون و ئەو جێگەی باوکی گرتەوە. باوکی زەنبیل هەمان شەو زوهەیر کوڕی موسەییبی کوشت و سەری لەجەستە جیا کردەوە و لەناو سوپاکەی باوکی هەڵیواسی.

حەسەن کوڕی سەهل لەمەرگی محەممەد ئاگادار بوویەوە. ئەو ڕۆشتە موبارەك و لەوێ مایەوە. لەوێوە سوپایەکی بۆ جەنگ لەگەڵ باوکی زەنبیل ڕەوانە کرد. سوپاکەی ئەو لەفەم ئەلسرات رووبەرووی سوپاکەی باوکی زەنبیل بوویەوە بەڵام شکستیان خوارد و ئەو رووی کردە لای براکەی هارون لەنیل. سوپاکەی حەسەن بۆ هێرش کردنە سەر ئەوان بەڕێکەوت و شەڕیان دەستپێکرد. هێشتا کاژێرێك بەسەر جەنگەکەدا تێپەڕی نەکردبوو کەهارون سوپاکەی شکستیان خوارد و روویان کردە مەداین. سەربازەکانی حەسەن بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەموو سامانەکانی نیل و گوندەکانی دەوروبەریان تالآن کرد.

منداڵەکانی هاشم و سەردارەکان کاتێك لەمەرگی محەممەد کوڕی باوکی خالید ئاگادار بوونەوە، بەخۆیان وت کەسێك لەناو خۆمان وەك خەلیفە هەڵدەبژێرین و مەئمون لەخەلافەت دوور دەخەینەوە. کاتێك هەواڵی شکستەکەی هارونیان بیست، پێداگرییان لەسەر ئەم بڕیارە گرت و مەبەستی ئەوەیان کرد مەنسور کوڕی مەهدی وەك خەلیفە دەستنیشان بکەن بەڵام ئەو رازی نەبوو. ئەویان وەك نوێنەری مەئمون لەبەغداد و عێراق هەڵبژارد و وتیان: ئێمە بەفەرمانڕەوایی حەسەن کوڕی سەهل، ئەم ئاگری لەئاگر بووە، رازی نابین. (حەسەن و سەهلی برای هەردووك زەردەشتی بوون و دواتر باوەڕیان بەئیسلام هێنا)

دەڵێن: کاتێك بەغدادییەکان دژی حەسەن کوڕی سەهل هاوکاری عیسایان کرد، حەسەن زانی توانای خۆڕاگری لەبەرابەر عیسادا نابێت. لەبەر ئەمە پێشنیاری پێکرد کچەکەی ئەو و سەد هەزار دینار وەربگرێت و بۆ خۆی و بنەماڵەکەی لەخەڵکانی بەغداد ئەمان وەربگرێت و فەرمانڕەوایی هەر شارێك دەخوازێت، هەڵیبژێرێت و لەبەرابەردا، رێگەی سازگاری لەگەڵ ئەو بگرێتەبەر. عیسا داوای دەستنووسی مەئمونی کرد و بۆ خەڵکانی بەغدادی نووسی: من کاروباری جەنگ

بەڕێوە دەبەم و ناتوانم باج وەربگرم، کەواتە کەسێك لەمناڵەکانی هاشم هەڵبژێرن. ئەوان مەنسور کوڕی مەهدیان هەڵبژارد. مەنسور وتی: من نوێنەری سەروەری باوەڕدارانم تا ئەو کاتەی خۆی دێت و هەرکەسێك دەخوازێت، وەك فەرمانڕەوا دەستنیشانی بکات. خەڵك بەم مەرجە رازی بوون.

مەنسور لەکلوازی ئوردووی لێدا و غەسان کوڕی عوباد کوڕی باوکی فەرەجی بۆ کوفە نارد. ئەو لەکۆشکی کوڕی هوبەیرە دابەزی و هێشتا نەهاتبووە خۆ، بینی حومەیدی توسی دەوری کۆشکەکەی گرتووە. حومەید غەسانی گرت و خوێنی هاوەڵانی ڕشت. ئەم ڕووداوە لەچواری رەجەب/ بیست و سێی ژانویە ڕوویدا.

مەنسور کوڕی مەهدی، محەممەد کوڕی یەقتینی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی حومەید ڕەوانە کرد. ئەو پێشڕەوی کرد و گەیشتە کوسا. هێشتا سوپاکەی خۆی نەرازاندبوویەوە حومەید هێرشی کردەسەر. ئەو لەنیل بۆسەی دانابوو. شەڕێکی خوێناوی هەڵگیرسا. کوڕی یەقتین شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکانی لەخوێنی خۆیاندا گەوزان و دەستەیەکیان ئەسیر کران و ژمارەیەکیان کەوتنە ناو ئاوەکە. حومەید گوندەکانی دەوروبەری کوسای تالآن کرد و بۆ نیل گەڕایەوە. کوڕی یەقتین لەسەرسەر ئوردووی لێدابوو.

عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالید، سەربازەکانی ئوردووی خۆی بژارد. هەموو سوارە و پیادەکان سەد و بیست و پێنج هەزار کەس بوون. هەر سوارەیەك چل درهەم و هەر پیادەیەك بیست درهەمی پێدا.

## پێشەنگەکانی فەرماندان بەچاکە

لەم ساڵەدا دەستەیەك بۆ جێبەجێ کردنی فەرماندان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە ئامادە بوون. بزوێنەری ئەوان بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کەخراپەکاران و سەرسەرییەکان و بەرەڵاکانی بەغداد و لەماڵ هەڵاتووان، خەڵکانیان ئازاردەدا و بێ شەرم کردن، گەندەڵی و فیرۆییان دەنایەوە، ڕێگەکانیان دەبڕی و بەئاشکرا ژن و مناڵەکانیان دەڕفاند و ناموسی کەسانیان دەبرد و هیچ هێزێك توانای ڕێگرتن لەوانی نەبوو. ئەگەر لەکەسێك داوای قەرز یا پاداشتیان دەکرد، کەس نەیدەتوانی

ناسازگاری بکات و ئەگەر گوندێکیان تالآن دەکرد، فەرمانداره‌کەی نەیدەتوانی ڕێگەیان لێبگرێت چوونکە هێزی فەرماندار لەوان پێکدەهات و ئەم دەستەیە بەهێزەکانی فەرماندار لەقەڵەم دەدران. ئەوان ڕێبوارانیان دەگرت وکەس بەرۆکی نەدەگرتن بەکورتی ئەوەی خەڵکان لەبارودۆخێکی ئاڵۆز و شێواو ژیانیان بەسەر دەبرد.

سەرەئەنجام ڕۆشتنە قوترەبۆل و بەئاشکرا تالآنیان کرد و ئەوەی سامان و چوارپێ بوو، ڕفاندیان و بێ ئەوەی کەس ڕێگرییان لێ بکات، لەبەغداد دەیانفرۆشت. خەڵکان سکالآیان بردە لای فەرماندار بەلآم کەس گرنگی پێنەدان. ئەم ڕووداوە لەکۆتاییەکانی مانگی شەعبان/ بیست و دووی مارس ڕوویدا.

کاتێك خەڵك بارودۆخیان بەمشێوەیە بینی، دانیشتووانی هەر کۆڵآن و گەڕەکێك ڕۆشتنە لای پێشەوا دینییەکانی خۆیان و پێشنیاری فەرماندان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپەیان کرد. خەڵکان دەستە دەستە ڕۆشتنە لای یەك و ڕاوێژیان کرد، وتیان: لەهەر گەڕەکێك یەك، دوو یا دە خراپەکاری لێیە و بەسەر ئێوەدا زاڵبوون لەگەڵ ئەوەی ژمارەی ئێوە زیاترە. ئەگەر کۆببنەوە دەتوانن لەناویان ببەن بەشێوەیەك چیتر دەست بۆ ئەو کارانە درێژ ناکەن. پیاوێك لەناو ئەوان بەناوی خالید دەروێش هەستا. داوای هاوکاری لەدانیشتووانی گەڕەکەی خۆی کرد تا فەرمان بەچاکە بدەن و ڕێگری لەخراپە بکەن. ئەوانیش وەلآمیان دایەوە. ڕووی کردە نزیکترینی خراپەکاران و لەماڵ هەلآتووان. ئەویان خستە پێش و لەبەرابەری وەستان و بۆ جەنگی ئەو قۆڵیان لێ هەڵماڵی. دەروێش شەڕی لەگەڵ کردن و توانی شکستیان پێ بێنێت، هەر خراپەکارێکی دەگرت، لێی دەدا، دەیگرت و تەسلیمی حکومەتی دەکرد بەلآم باوەڕی بەگۆڕینی حکومەت نەبوو.

دوای ئەو پیاوێك لەحەربییە (سوپاییەکانی منداڵەکانی عەباس کەزۆرینەیان لەئێرانییەکان پێك دەهاتن) بەناوی سەهل کوڕی سەلامەتی ئەنساری لەخەڵکانی خوراسان بەنازناوی باوکی حاتەم قووت بوویەوە و خەڵکانی بۆ فەرماندان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە و هەڵس وکەوت بەشێوەی قورئان و سوونەت هاندا، قورئانێکی بەملی خۆیەوە هەڵواسی و هەزاران بەڵگەی بۆ خەڵکی گەڕەکەکەی هێنایەوە و

ئەوان بەپێشنیارەکانی رازی بوون. هەموو خەڵکانی مناڵەکانی هاشم وکەسانی تری لەورد و بچوك لەدەوری خۆی کۆکردەوە. ژمارەیەکی زۆریان دەوریان گرت و پەیمانیان بەست لەگەڵ نەیارەکانی ئەو بجەنگن. ئەو لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بەناو کۆڵان و گەڕەکەکانی بەغداد دەسوڕایەوە. بزوتنەوەی سەهل لەچواری رەمەزان و بزوتنەوەی دەروێش دوو یا سێ رۆژ پێش ئەو دەستی پێکرد.

مەنسور کوڕی[1] مەهدی و عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالید لەم دوو بزوتنەوەیە ئاگادار بوونەوە. ئەمە بووە هۆکاری سەرشۆری ئەوان چوونکە زۆرینەی سوپاکەیان لەو کەسانە پێك دەهات کە لەماڵەوە هەڵاتبوون و هیچ سوودێکیان پێ نەدەگەیاندن. مەنسور لەو کاتەدا هاتە بەغداد لەکاتێکدا عیسا نامەی بۆ حەسەن کوڕی سەهل نووسی و داوای ئەمانی لێکرد. حەسەن ئەمانی بەو و خەڵکانی بەغداد بەخشی و پەیمانیدا ئەگەر داهاتێکی بەدەست بگات، مانگانەی شەش مانگ بەسوپاکەی خۆی و سوپاکەی بەغداد بدات. عیسا لەئوردووگاکەی حەسەن رێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەسیانزەی شەوال/چواردەی مەی هاتە ناو بەغداد. سەربازەکان شوێن کارەکانی خۆیان کەوتن و خەڵکانی بەغداد لەسازگاری حەسەن رازی بوون. سەهل کوڕی سەلامەت بەهەمان شێوە فەرمانی بەچاکە دەدا و رێگەی لەخراپە دەگرت.

## بەیعەتی جێگری بۆ عەلی کوڕی موسا

لەم ساڵەدا مەئمون، عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی ئەبی تالبی وەك جێگری خەلیفەی موسوڵمانان دوای خۆی دەستنیشان کرد و نازناوی رەزامەندی بنەماڵەی محەممەدی پێبەخشی. فەرمانی بەسوپاکەیدا جلی رەش فرێبدەن و جلی سەوز بپۆشن. ئەم فەرمانەی بۆ هەموو سەرزەمینە ئیسلامییەکان نووسی. حەسەن کوڕی سەهل دوای گەڕانەوەی عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالید بۆ بەغداد نامەیەکی بۆ نووسی و ئەوی لەجێگری عەلی کوڕی موسا ئاگادار کردەوە.

مەئمون لێکۆڵینەوەی لەمناڵەکانی عەباس و عەلی کرد و کەسی بەچاکتر، داوێن

پاكتر و فرەزانتر لەو نەبینی. مەئمون، عەلی كوڕی موسای بەڕەزای بنەماڵەی محەممەد ناو برد. مەئمون فەرمانی بەعیسا كوڕی محەممەد دا جل و بەرگی ڕەش لەبەر شوێنكەوتەكانی خۆی داكەنێت و بەجلی سەوز دایانپۆشێت. ئەم ڕووداوە لەدووەم شەو لەرەمەزانی ساڵی ٢٠١/ بیست و پێنجی مارسی ٨١٦ زایینی ڕوویدا. مەئمون فەرمانی بەعیسا كوڕی محەممەد دا لەهاوەڵان، سەربازەكان، سەركردەكان و مناڵەكانی هاشم بۆ عەلی كوڕی موسا بەیعەت وەربگرێت و هەمووان سەوز بپۆشن و ئەم فەرمانە بەخەڵكانی بەغداد ڕاگەیێنن. عیسا كوڕی محەممەد ئەم فەرمانەی دەركرد. دەستەیەك ملكەچی فەرمان بوون و دەستەیەك ڕازی نەبوون و وتیان: خەلافەت لەناو مناڵەكانی عەباس ناڕواتەدەر. ئەم لەوتەكانی فەزڵ كوڕی سەهلە. ئەوان چەند ڕۆژێك لەسەر ئەم بڕوایە مانەوە. دەستەیەكیش لەوان وتیان: كەسێك لەناو خۆمان وەك خەلیفە هەڵدەبژێرین و مەئمون لەسەر تەخت دەهێنینە خوار. مەنسور و ئیبراهیم دوو مناڵەكەی مەهدی زیاتر لەكەسانیتر لەسەر ئەم وتەیە پێداگرییان دەكرد.

## هۆكاری بەیعەت بۆ ئیبراهیم كوڕی مەهدی

لەزیحەججەی ئەم ساڵە/ ژوئەن، خەڵكانی بەغداد بڕیاریاندا وەك خەلیفە بەیعەت لەگەڵ ئیبراهیم كوڕی مەهدی ببەستن و مەئمون لەسەر تەخت بێننە خوار.

هۆكاری ئەم كارە – وەك ئاماژەی پێدرا – ناسازگاری لەفەرمانڕەوایی حەسەن كوڕی سەهل و وەرگرتنی بەیعەت بۆ عەلی كوڕی موسا بوو. عەباسییەكان وایان نیشاندا پێشتر لەپێنجی زیحەججە/ بیست و چواری ژوئەن وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ ئیبراهیم كردووە. ئەوان لەشانۆگەرییەكی پێشوەخت پیاوێكیان فێركرد لەرۆژی هەینیدا بڵێت: ئێمە خوازیاری مەئمونین و ئیبراهیم بەجێگری ئەو دەزانین و پیاوێكی دیكەیان فێركرد تا بەدوای پیاوی یەكەم بڵێت: ڕازی نابین مەگەر ئەوەی وەك خەلیفە بەیعەت لەگەڵ ئیبراهیم كوڕی مەهدی بكەین و ئیسحاق كوڕی موسای هادی وەك جێگری ئەو بناسێنین، ئەی خەڵكینە، مەئمون لەسەر تەخت بێننە خوار. خەڵكان ئەو كارەیان خوێند و كەس نەیتوانی نوێژی هەینی

بخوێنێت. هەرکەس شوێن کاری خۆی کەوت. ئەم رووداوە لەبیست و هەشتی زیحەججەی ئەم ساڵە/ حەقدەی ژوئیەی ٨١٦ زاییینی روویدا.

## دەست بەسەردا گرتنی کوێستانەکانی تەبەرستان و دەیلەم

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی خوردادبێە فەرمانداری تەبەرستان لەسەرزەمینی دەیلەم لارز و شررزای گرت و دەستی بەسەر کوێستانەکانی تەبەرستانیش گرت وشەهریار کوڕی شەروینی لەسەر تەخت هێنایە خوار. مەئمون مازیار کوڕی قارنی ڕەوانە کرد و باوکی لەیلی فەرمانڕەوایی دەیلەمی زیندانی کرد.

## دەسپێکردنی بزوتنەوەی بابەکی خوڕەمی

لەم ساڵەدا بابەکی خوڕەمی لەجایودانییە بزوتنەوەکەی دەستپێکرد. خەڵکی ئەم دیارە لەهاوەڵانی جاوید کوڕی سەهل پاشای بەز (یەکێك لەبەشەکانی ئازەربایەجان) بوون کەوای نیشان دەدا رۆحی جاویدان (هەمیشەیی) لەودا جێگیر بووە. بابەك ئاژاوە و خراپەکاری دەستپێکرد. مانای وشەی جاویدان، پایەدار و هەمیشەییە و مانی خوڕەم، شادییە. ئەمە لەباوەڕی زەردەشتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. شوێنکەوتەکانی ئەم ئایینە لەگەڵ دایك، خوشك، و کچی خۆیان پەیوەندی هاوسەرگیری دەبەستن و لەبەر ئەمە بەئایینی (شەلفیە[11])یش ناویان بردووە. ئەوان باوەڕیان بەگواستنەوەی رۆح لەجەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی دیکە هەیە و ئەوەی کە رۆحی ئاژەڵ دەچێتە ناو جەستەی ئاژەڵێکی دیکە.

---

[11] شەلفیە بەمانای نێوان ڕانی ژنە، شەرمی ژن

## فەرمانڕەوایی زیادە اللە کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب لەئەفریقییە

لەشەشی. زیحەججەی ئەم ساڵە/ بیستی ژوئەنی ٨١٦ زایینی باوکی عەباس عەبدواللە کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە مرد. بۆ ماوەی پێنج ساڵ و نزیکەی دوو مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد.

چۆنیەتی مەرگی ئەو بەم شێوە بوو بۆ هەر جەریب، ساڵانە هەژدە دیناری وەك ماڵیاتی دیاریکرد. ئەمە بۆ خەڵکان گران و دژوار بوو. سکالآیان بەرز بوویەوە. پیاوێك لەوان بەناوی حەفس کوڕی عومەری جەزری لەگەڵ دەستەیەکی دیکە ڕۆشتنە لای فەرمانڕەوا و ڕێگەی ئەم کارەیان لێگرت، چاکەی ئەویان دەویست و لەسزاکانی ئەودنیا و ناوزڕانی ئەم دنیا ئاگاداریان کردەوە و مەترسی لەدەستدانی پێگەکەیان پێ ڕاگەیاند. ئەم فەرموودەی خوایان بیرخستەوە: نایگۆڕێت و گۆڕانکاری تیا دروست ناکات ئەوەی خەڵکێك هەیانە و ئەو بارودۆخەی تیایدا دەژین تا ئەوەی بگۆڕن و بیگۆڕن ئەوەی لەدەستیاندایە لەکردەوە چاکەکان، کاتێك خواوەند خراپە بەسەر خەڵکێکدا دەبارێنێت و ڕێگەی گەڕانەوە نییە، و ئەوان جگە لای خوا، لەهیچ شوێنێکی دیکە ڕێگە چارەیان دەست ناکەوێت.

باوکی عەباس مەبەستی ئەوەی کرد گرنگییان پێ نەدات و ئەوان ڕوویان کردە قەیرەوان. حەفس پێی وتن: دەستنوێژ بگرین و نوێژ بخوێنین تا خواوەند قورسایی سەر شانی ئەم خەڵکە سووك بکات. ئەو کارەیان کرد و هێشتا پێنج ڕۆژی نەخایاندبوو بڕینێك لەژێر گوێچکەی باوکی عەباس دەمی کردەوە و ماوەیەك دواتر بەهۆی ئەو برینەوە مرد. باوکی عەباس یەکێك بوو لەجوانترین پیاوەکانی سەردەمی خۆی. کاتێك مرد، براکەی زیادە اللە کوڕی ئیبراهیم لەسەر تەخت دانیشت. ئەو فەرمانڕەوایەك بوو دڵەکانی ئاسوودە کرد وئارامی بەهەمووان بەخشی و جیهان لەرۆژگاری ئەو ئەمن و ئارام بوو.

زیادە اللە چەندین کەشتی جەنگی ئامادە کرد. ئەم سوپایە ڕێگەی

سەردانییەیان گرتەبەر کە لەدەستی ڕۆمیەکاندا بوو. چەند کەشتییەك دوای ئەوەی سوپاکەی زیاد الله تالاّنییەکانیان لەڕۆمییەکان سەند، لەکارکەوتن و لەڕێگە مانەوە و ژمارەیەکی زۆر لەکەسەکانی ناوی کوژران. ئەوانەی تەندروست گەڕانەوە، لەلایەن زیادە الله وە چاکەیان لەگەڵ کرا و بەخششیان پێ بەخشرا.

لەساڵی ٨٢٢/٢٠٧ زایینی زیاد کوڕی سەهل ناسراو بەکوڕی سەقلەبییە شۆڕشی دەستپێکرد و دەستەیەکی فراوانی کۆکردەوە و گەمارۆی خستە سەر باجە. زیادە الله سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد. سوپاکەی زیاد الله پاشەکشێیان بەکوڕی سەقلەبییە کرد و هاوەڵانی ئەوانیان کوشتار کرد.

لەساڵی ٨٢٣/٢٠٨ زایینی بەزیاد اللەیان وت: مەنسور کوڕی نوسەیری تونبەزی لەتونس مەبەستی بەرز کردنەوەی ئالاّی شۆڕشی هەیە و بۆ ئەم کارە هەوڵ دەدات و نامە بۆ سوپاییەکان دەنێرێت و بۆ شۆڕش هانیان دەدات. کاتێك لەمەبەستەکەی دڵنیا بوو، فەرماندەیەك بەناوی محەممەد کوڕی حەمزەی لەگەڵ سێسەد سوار ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا مەبەستەکەی خۆی ئاشکرا نەکات و بەخێرایی خۆی بگەیینێتە ئەو سەرزەمینە (تونس) و بێ ئەوەی مەنسور هەست بکات، بیگرێت و بیهێنێت.

محەممەد ڕووی کردە ڕێگەی تونس و ڕۆشتە ناو شارەکە بەلاّم مەنسوری لەوێ دەست نەکەوت چوونکە ئەو ڕۆشتبووە کۆشکەکەی خۆی لەتونبەزم. محەممەد، قازی تونسی لەگەڵ چل کەس لەگەورەکان بۆ لای ئەو نارد. ئەوان کارەکانی مەنسوریان بەقێزەون لەقەڵەمدا و ڕێگەی شۆڕشیان لێگرت و پێشنیاری فەرمانبەرییان پێکرد. مەنسور وتی: من نافەرمانی فەرمانەکانی ئەمیر نیم بەلاّم ئەمڕۆ میوانی ئێمە بن تا میوانداری محەممەد و هاوەڵانی بکەین. ئەوان مانەوە و مەنسور بۆ محەممەد و هاوەڵانی ئەو نشینگەیەکی ڕاحەت و ئاسوودەی ئامادە کرد و مەڕ و مانگا و چەندین جۆری دیکەی خواردەمەنی ڕەوانە کرد و نامەیەکی بۆ نووسی: من لەگەڵ قازی و سەرکردەکان بەرەو لای تۆ دێم. محەممەد نەرم بوو و فەرمانی سەربڕینی مەڕومالاّتی دەرکرد، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی خواردیان و خواردیانەوە. بۆ شەو، مەنسور، قازی و کەسانی هاوڕێی زیندانی کرد و لەگەڵ

سەربازەکانی خۆی بەخێرایی ڕێگەی تونسی گرتەبەر و بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتە ئەو میوانخانەی محەممەد و هاوەڵانی لەوێ نیشتەجێ کرابوون. فەرمانی لێدانی تەپڵەکانی دەرکرد و خۆی و هاوەڵانی تەکبیریان بەرز کردەوە. محەممەد و سوپا مەستەکەی پەلاماری کەرەستەکانی جەنگیاندا بەڵام مەنسور دەستی بەسەردا گرت وخەڵکان لەهەموو شوێنێکەوە هاتن و ئەوانیان بەردباران کرد. شەڕ دەستپێکرد و هاوەڵانی محەممەد کوژران وکەسیان رزگاری نەبوو مەگەر ئەوکەسانەی خۆیان خستە ناو ئاو و هەڵاتن. ئەم ڕووداوە لەمانگی سەفەری ئەم ساڵە/ ٢١ ئوت ڕوویدا. بەرەبەیانان سەربازەکانی مەنسور کۆبوونەوە و وتیان: تۆ بەکەسێکی بڕواپێکراو نازانین. ئەگەری هەیە زیاد الله تۆ بباتە لای خۆی و بەسامانی ئەم دنیایە فریوت بدات و پەیوەستی ئەو ببیت. ئەگەر دەخوازی لەگەڵ تۆ بمێنینەوە دەبێت خوێنی ئەو کەسە لەبنەماڵەکەی زیادالله بڕێژێت کەلای تۆ دەژیت تا کینەی تۆ لەدڵ بگرێت و تۆ نەتوانی پەیوەستی ببیت. ئەو ئیسماعیل کوڕی سوفیان کوڕی سالم کوڕی عیقالی بانگ کرد. ئەو لەبنەماڵەی زیادالله و کارگوزاری تونس بوو. کاتێک ئەویان هێنا، فەرمانی کوشتنی دەرکرد.

کاتێک زیادەالله لەکارەکانی مەنسور ئاگادار بوویەوە، سوپایەکی گەورەی ڕەوانە کرد و غەلبونی وەك فەرماندەی ئەوان دیاریکرد. ناوی غەلبون، ئەغلەب کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەغلەبە کەوەزیری زیادالله بوو. ئەو بۆ جەنگی مەنسور بەرێکەوت. لەکاتی ماڵئاوایی زیادالله ئەوانی ترساند کە لەئەگەری شکست لەم جەنگە، دەبێت خۆیان بەمردوو لەقەڵەم بدەن. کاتێک سوپاکەی زیادالله گەیشتە تونس، مەنسور هێرشی کردەسەریان ولەدەی ڕەبیع الاول/شەشی ئۆکتۆبەر سوپاکەی زیادەالله شکستی خوارد. سەرکردەکانی سوپا بەغەلبونیان وت: ئێمە لەزیادەالله بۆ گیانی خۆمان دەترسین، ئەگەر ئەمانمان بۆ وەرگریت دێینە لای ئەو. ئەمەیان وت و بڵاوەیان لێکرد و دەستیان بەسەر چەند شارێکدا گرت. ئەم شارانە بریتی بوون لە: باجە، جەزیرە، سەتفورە، مسر، ئوربوس و چەند شارێکی دیکە. کاروباری ئەفریقییە شێوا و هەموو سەربازەکان بەهۆی خراپی هەڵس و کەوتی زیادالله پەیوەستی سوپاکەی مەنسور بوون.

مەنسور کاتێك ژمارەی سوپاکەی زیادی کرد، ڕێگەی قەیرەوانی گرتەبەر و لەجومادی الاول/ نۆڤەمبەر، گەمارۆی خستە سەر شارەکە و خەندەکی بەدەوری سوپاکەی هەڵکەند. لەنێوان مەنسور و زیادەالله چەندین جەنگ ڕوویدا. دانیشتووانی ناو شاری قەیرەوان خوازیاری پەیوەست بوون بەمەنسور بوون. گەمارۆکە چل ڕۆژ درێژەی کێشا.

زیادەالله هێزەکانی خۆی لەسوار و پیادە کۆکردەوە. ژمارەی سوپاکەی فراوان بوو. کاتێك مەنسور ئەم سوپایەی بینی، ترسا چوونکە چاوەڕوانی هێزێکی لەو چەشنەی نەدەکرد و ئەوی بەکەسێکی ناتەوان دەبینی. مەنسور لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی برد. دوو سوپا کەوتنە گیانی یەك و شەڕێکی خوێناوی دەستی پێکرد. مەنسور و سوپاکەی شکستیان خواردو هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. ئەم جەنگە لەنیوەی جومادی الاخر/هەشتی ژانویە ڕوویدا. زیادەالله فەرمانیدا تۆڵە لەدانیشتووانی قەیرەوان کەدەستی هاوکارییان بۆ مەنسور درێژ کردبوو و پێشتر هاورێیەتی عیمران کوڕی موجالیدیان کردبوو لەکاتی جەنگ لەگەڵ باوکی، ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، تۆڵە بستێنن. بەڵام پێشەوایانی دینی ڕێگەی ئەم کارەیان لێگرت و لەم کارە چاوپۆشی کرد. تەنیا دیواری شارەکەی وێران کرد.

کاتێك مەنسور شکستی خوارد، هاوەڵانی وەك عامیر کوڕی نافیع و عەبدولسەلام کوڕی مەفرەج لێی جیابوونەوە و ڕوویان کردە سەرزەمینەکانی دیکە کەپێشتر دەستیان بەسەردا گرتبوو. زیادەالله لەساڵی ٢٠٩/ ٨٢٤ زایینی سوپایەکی گەورەی بۆ سەبیبە ڕەوانە کرد و محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەغلەبی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد. لەوشارەدا دەستەیەك لەو سوپاییانە ژیانیان بەسەر دەبرد کەهاورێیانی مەنسور بوون وفەرماندەکەیان عومەر کوڕی نافیع بوو. ئەم دوو سوپا لەبیستی موحەرەم/ هەژدەی ئوت ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و هێزی کوڕی ئەغلەب شکستی خوارد و لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی بۆ قەیرەوان گەڕایەوە. زیادالله ئەم شکستەی بەگەورە زانی و لەبەر ئەمە سەر لەنوێ هێزی کۆکردەوە و پارەیەکی زۆری بەخشی.

ژن و منالی ئەو سوپاییانەی پەیوەستی مەنسور ببوون، لەقەیرەوان ژیانیان بەسەر دەبرد بەلام زیادالله دەستدرێژی نەکردە سەریان. سەربازەکان بەمەنسوریان وت: ئەگەر فێلێك بەکار ببەیت تا ژن و منالەکانی ئێمە لەقەیرەوان بێنیتەدەر، ئاسوودە دەبین. مەنسور هێرشی کردە سەر قەیرەوان و بۆ ماوەی شانزە رۆژ گەمارۆی خستە سەر زیادالله بەلام جەنگ روویندا. بەمشێوەیە سەربازەکان ژن و منالەکانی خۆیان لەقەیرەوان هێنایەدەر و مەنسور بۆ تونس گەڕایەوە. لەهەموو ئەفریقییە تەنیا قابس، ئاحیل، نێفزاوە و تەرابلوس لەژێر فەرمانی زیادەالله مایەوە و تەنیا خەلکانی ئەم سەرزەمینانە ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا.

سوپاییەکان پەیامیان بۆ زیادەالله نارد: رێگەی خۆت بگرەبەر و ئەفریقییە بەجێبێلە، ئەمانت پێ دەبەخشین وکەس دەست درێژی ناکاتە سەر مال و منالی تۆ، هەموو سامانی کۆشکەکەت هەلگرە و سوار ئەسپەکەی خۆت بەرێکەوە. زیادەالله خەمبار بوو.سوفیان کوڕی سەوادە پێی وت: جلەوی سوپاکەی خۆت بەمن بسپێرە تا دووسەد سوار لەناویان هەلبژێرم و بەرەو نێفزاوە بڕۆم چوونکە ئاگادار بوومەتەوە عامیر کوڕی نافیع دەخوازێت هێرشیان بکاتەسەر. ئەگەر سەرکەوتنم بەدەست هێنا، بەمەبەستەکەی خۆت گەشتوویت و گەرنە بۆچوونەکەی خۆت بەکار دەبەیت. زیادەالله سوپاکەی خستە بەردەست وئەو دووسەد سواری هەلبژارد ورێگەی نێفزاوەی گرتەبەر. سوفیان داوای هاوکاری لەبەربەرییەکانی نێفزاوە کرد. ئەوان وەلامیان دایەوە و دەستی هاوکارییان بۆ درێژ کرد. عامیر کوڕی نافیع لەگەل سوپاکەی خۆی رووبەروویان بوویەوە وشەڕێکی خوێناوی هەلگیرسا. عامر و هێزەکانی شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا.

عامر بۆ قەستەتیلە گەڕایەوە وبۆ ماوەی سێ رۆژ لەو ناوچەیە باجی کۆکردەوە. دواتر ئەو ناوچەیان بەجێهێشت. سوفیان کەسێکی لەوێ دانا تا کاروبارەکان رێکبخات بەلام ئەو کەسە لەترسی خەلکەکەی هەلات. خەلکی قەستەتیلە کەسیان بۆ لای کوڕی سەوادە نارد و داوایان لێکرد بڕواتە لایان. کوڕی سوادە ڕۆشتە لایان و ئەو سەرزەمینەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و کاروبارەکانی رێکخست.

دەڵێن: ئەم ڕووداوانە لەساڵی ٢٠٩ ڕوویان نەداوە بەڵکو ساڵی ڕوودانیان ٢١٩ کۆچییە.

گرتنی دوورگەی سەقلیە لەسەردەستی زیادەالله و جەنگەکانی ئەو تا کاتی مەرگ

لەساڵی دووسەد و دوانزە/٨٢٧ زایینی زیادەالله هێزێکی دەریایی ئامادە کرد و بۆ دوورگەی سەقەلییە (سیسیل) ڕەوانەی کردن. ئەسەد کوڕی فورات، قازی قەیرەوانی کردە فەرمانده‌ی ئەوان. ئەو لەشوێنکەوتەکانی ئایینی مالکی بوو کەنامەی ئەسەدییەی لەفقە لەسەر شێوەی مالکییەکان نووسیوە. کاتێك لەگەڵ سوپاکەی گەیشتە ئەم دوورگە، دەستیان بەسەر بەشێکی زۆریدا گرت.

هۆکاری ئەم هێرشە ئەوە بوو پاشای ڕۆم لەقوستەنتەنییە بەتریرکێکی[12] لەساڵی ٨٢٦/٢١١ زایینی وەك فەرمانڕەوای دوورگەی سیسیل ڕەوانە کرد کە بەقوستەنتەین ناودەبرا. کاتێك قوستەنتین گەیشتە سیسیل، کەسێکی ڕۆمی بەناوی فیمی وەك فەرماندەی هێزی دەریایی دیاریکرد. ئەو فەرماندەیەکی دوورئەندێش و بوێر بوو. فیمی مەبەستی ئەفریقییەی کرد و لەکەنارەکان ژمارەیەکی زۆر لەبازرگانەکانی گرت و کاڵاکانی ئەوانی تاڵان کرد و بۆ ماوەیەك کەنارەکانی ئەفریقییەی گرتە ژێر دەست. پاشای ڕۆم ئاگادار بوویەوە و فەرمانی بەقوستەنتیندا فیمی لەفەرماندەیی دوور بخاتەوە و سزای بدات. فیمی لەم فەرمانە ئاگادار بوویەوە و بەهاوەڵانی خۆی ڕاگەیاند. هاوەڵانی توڕە بوون و بۆ ناسازگاری هانیاندا. فیمی لەگەڵ کەشتییەکان ڕووی کردە سیسیل و دەستی بەسەر شاری سیراکوزدا (سەرقوسە) گرت و بەرەو لای قوستەنتین بەرێکەوت و ڕووبەڕووی بوویەوە. قوستەنتین بۆ شاری قەتانییە هەڵات. فیمی سوپایەکی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد. قوستەنتین لەهەڵاتن بەردەوام بوو تا ئەوەی سەرئەنجام گرتیان و کوشتیان و فیمییان وەك پاشا ناساند. پیاوێکی بەناوی بەلاتەی کردە فەرمانڕەوای دوورگە. ئەو ڕێگەی ناسازگاری فیمی گرتەبەر و شۆڕشی کرد.

---

[12] گەورەترین قەشە لەناو مەسیحییەکان

هاوڕێ لەگەڵ کوڕە مامەکەی خۆی بەناوی میخائیل فەرمانڕەوای شاری بەلەرم، ژمارەیەکی زۆر سەربازیان کۆکردەوە و دژی فیمی جەنگیان دەستپێکرد و شکستیان پێهێنا و دەستیان بەسەر بەلاتە و سیراکوزدا گرت.

فیمی و هاوەڵانی بەکەشتی بەرەو ئەفریقییە بەرێکەوتن. ئەو کەسی بۆ لای زیادەالله نارد و داوای هاوکاری لێکرد و مژدەی فەرمانڕەوایی دوورگەی سیسیلی پێدا. زیادەالله لەرەبیع الاولی ساڵی ٢١٢/مەی ٨٢٧ زایینی سوپایەکی بۆ هاوکاری ئەو نارد. سوپاکە گەیشتە شاری مازەری سیسیل و بۆ جەنگی بەلاتە بەرێکەوتن کەرێگەی ناسازگاری فیمی گرتبووە بەر. ڕۆمییەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە. لەم کاتەدا موسوڵمانان هاتنە ناو گۆڕەپانی جەنگ و داوایان لەفیمی و سوپاکەی کرد، خۆیان لەجەنگ بەدوور بگرن. شەڕی نێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان هەڵگیرسا و سوپای ڕۆم شکستی خوارد. موسوڵمانان سامان و چوارپێکانی ئەوانیان تالآن کرد و بەلاتە بۆ قیلوریيە هەلآت و لەوێ کوژرا.

موسوڵمانان دەستیان بەسەر چەندین قەلآی جەزیرەدا گرت و خۆیان گەیاندە قەلآیەك بەناوی کوڕات. ژمارەیەکی زۆر لەوێ کۆببوونەوە. ئەوان ئەسەد کوڕی فوراتی قازی، فەرماندەی موسوڵمانەکانیان فریودا و وایان نیشاند کەملکەچی فەرمانەکانی ئەون. فیمی خیانەتی کرد و کاتێك ئەوانی بینی، پەیوەستیان بوو. نامەی بۆ نووسین و داوای لێکردن خۆڕاگربن و پارێزگاری لەشارەکەی خۆیان بکەن و بۆ هەڵخەڵەتاندن باج بەئەسەد بدەن و داوای لێبکەن لێیان نزیك نەبێتەوە. ئەسەد بەپێشنیارەکەی ئەوان ڕازی و چەند ڕۆژێك لێیان نزیك نەبوویەوە. ئەوان خۆیان بۆ گەمارۆ خرانەسەر ئامادە کرد و خواردەمەنی و بژێوی ژیانیان پاشەکەوت کرد، بەلآم دووبارە جەنگ هەڵگیرسا و ئەسەد سوپاکەی دەستە دەستە بەکەنارەکان ڕەوانە کرد. بڕێکی زۆر کەرەستەی شەڕیان دەستکەوت و دەستیان بەسەر چەندین ئاوەدانی لەدەوروبەری سیراکوزدا گرت و لەوشکی و دەریاوە دەوری سیراکوزیان گرت. لەئەفریقییەوە هاوکاری زۆر بەدەستی قەلآنشینەکان گەیشت.، ئەوان بەسوپاکە گەورەکەی خۆیان پەیوەستیان بوون و ڕوویان کردە بەلەرم. موسوڵمانان خەندەکیان بەدەوری خۆیان هەڵکەند و لەدەرەوەی خەندەکە

چاڵی زۆریان هەڵکەند و سەریان داپۆشی. کاتێك رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان، ژمارەیەکی زۆریان کەوتنە ناو چاڵەکان.

موسوڵمانان بارودۆخیان لەسەر دانیشتووانی سیراکوز دژوار کرد. چەندین کەشتی لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەقوستەنتەنییەوە گەیشتە ئەو سەرزەمینە و ئەمە لەو رۆژانەدا بوو کە لەساڵی ٨٢٨/٢١٣ زایینی نەخۆشی وەبا یەخەی موسوڵمانانی گرت و گیانی ژمارەیەکی زۆری وەرگرت. ئەسەد کوڕی فوراتی فەرماندە یەکێك بوو لەوانەی بەم نەخۆشییە مرد. دوای ئەو محەممەد کوڕی باوکی جەواری فەرماندەیی موسوڵمانانی گرتەدەست. موسوڵمانان لەبەر ئەوەی لەلایەك ئەم نەخۆشییە و لەلایەکی دیکە رۆمییەکان هێرشیان دەکردنەسەر، بەناچاری بەمەبەستی پاشەکشێ سوار کەشتییەکان بوون بەڵام ڕۆمییەکان سوار کەشتییەکانی خۆیان بوون و لەباب ئەلمێرسی لەنگەریان گرت تا رێگر بن لەگەڕانەوەی موسوڵمانان.

موسوڵمانان کاتێك بارودۆخیان بەمشێوەیە بینی، کەشتییەکانی خۆیان سوتاند و گەڕانەوە و روویان کردە شاری میناو و بۆ ماوەی سێ رۆژ دەوریاندا و سەرئەنجام دەستیان بەسەر قەڵاکەیدا گرت. دەستەیەك لەوان روویان کردە قەڵای جۆرجەنت و لەگەڵ خەڵکەکەی جەنگان و دەستیان بەسەردا گرت ولەوێ نیشتەجێ بوون. بەمشێوەیە گیان و ناخی موسوڵمانان کەمێك ئارام بوویەوە.

ئەوان بەدوای ئەم سەرکەوتنانە لەگەڵ فیمی رەوانەی قەسریانە بوون. خەڵکی ئەم شارە بۆ پێشوازی هاتن و لەبەردەم پێی فیمی، زەوییان ماچ کرد و رازی بوون بەوەی گوێرایەڵی فەرمانەکانی فیمی بن. بەمشێوەیە فریویاندا و خوێنیان ڕشت.

لەوکاتەدا ژمارەیەکی زۆری سەرباز لەقوستەنتەنییەوە بۆ هاوکاری خەڵکانی دوورگەکە هات و هەردوو سوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەست. رۆمییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا و ئەوانەی رزگاریان بوو، خۆیان گەیاندە قەسریانە. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی باوکی جەواری فەرماندەی موسوڵمانەکان مرد و زوهەیر کوڕی غەوس جێگەی ئەوی گرتەوە. دەستەیەك لەموسوڵمانان بۆ کۆکردنەوەی تالانی ڕۆشتبوونەدەر و رووبەرووی دەستەیەك لەرۆمییەکان

بوونەوە. جەنگ لەنێوان ئەوان دەستپێکرد و موسوڵمانان شکستیان خوارد و بەیانی ئەو رۆژە لەگەڵ سوپایەکی گەورە گەڕانەوە و رۆمییەکان رووبەروویان بوونەوە. دووبارە هەردوولا سوپایان رازاندەوە و ئەم جارەیش موسوڵمانان شکستیان خوارد و هەزار سەربازیان لێ کوژرا. پاشماوەکان بەدەوری ئۆردووگاکە خەندەکیان هەڵکەند و سەنگەریان لێدا و رۆمییەکان گەمارۆیان خستنەسەر. جەنگ لەنێوان ئەوان بەردەوام بوو. کەمی خواردەمەنی، گوشاری دەخستە سەر موسوڵمانان و لەبەر ئەمە مەبەستی ئەوەیان کرد بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەنە سەر رۆمییەکان. بەڵام رۆمییەکان لەمەبەستەکەیان ئاگادار بوونەوە و لەخێوەتەکان هاتنەدەر و لەنزیک خێوەتەکان چاوەڕوانی هێرشی موسوڵمانان بون. کاتێك موسوڵمانان هاتن، کەسیان نەبینی، لەناکاو هێزە رۆمییەکان هێرشیان کردنە سەر و ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان کوژران. پاشماوەکان بەرەو میناو هەڵاتن. گەمارۆی سەر ئەوان بەردەوام بوو تا ئەو جێگەی موسوڵمانان گۆشتی چوارپێکان و سەگیان کردە خۆراکی خۆیان.

کاتێك موسوڵمانانی جۆرجەنت لەباروDۆخی موسوڵمانانی برایان ئاگادار بووینەوە، شارەکەیان وێران کردە و رێگەی مازەردیان گرتەبەر بەڵام نەیانتوانی هاوکاری برا موسوڵمانەکانیان بکەن. ئەم پێشهاتە تا ساڵی ٨٢٩/٢١٤ درێژەی کێشا. موسوڵمانان لە لەناوچوونی گشتی نزیك بوونەوە کە لەناکاو کەشتییە جەنگییەکان لەئاندۆلۆسەوە هاتن. لەم کاتەدا چەندین کەشتی بۆ هاوکاری موسوڵمانان نزیك بوونەوە. ژمارەی کەشتییەکان نزیك بەسێیەد دانە بوو. ئەوان لەسەراسەری دوورگەکەدا لەنگەریان گرت و ئەمەیش رۆمییەکانی ناچار بەهەڵاتن کرد کەگەمارۆیان خستبووە سەر موسوڵمانان. خواوەند خەمی موسوڵمانانی کەم کردەوە. موسوڵمانان رێگەی بەلەرمیان گرتەبەر و گەمارۆیان خستە سەر و بارودۆخیان لەسەر دانیشتووانەکەی دژوار کرد. پاشایەکەیان بۆ خۆی و سامان و بنەماڵەکەی داوای ئەمانی کرد. موسوڵمانان ئەمانیان پێ بەخشی. ئەو لەرێگەی دەریاوە بەرەو رۆم بەرێکەوت.

موسوڵمانان لەمانگی رەجەبی ساڵی ٢١٦/ ئوتی ٨٣١ زایینی ڕۆشتنە ناو

شارەکە و بینیان دانیشتووانەکەی کەمتر لەسێ هەزار کەسە لەکاتێکدا لەسەرەتای گەمارۆکە ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی حەفتا هەزار کەس بوو. ((هەموویان لەبرسانا مردبوون)) لەنێوان موسوڵمانانی ئەفریقییە و ئاندۆلۆس ئاژاوە هاتە ئاراوە بەلاّم دواتر ئاشتی لەنێوانیاندا سەقامگیر کرا. موسوڵمانان تا ساڵی ٨٣١/٢١٦ زایینی مانەوە و دواتر هێرشیان کردە سەر قەسریانە. رۆمییەکانی ئەم شارە لەبەرابەر موسوڵمانان خۆڕاگرییان کرد و دوای شەڕێکی تاقەت پڕوکێن، خواوەند ئەم شارەی پێشکەش بەموسوڵمانان کرد و رۆمییەکان بۆ ئوردووگاکەی خۆیان هەلاّتن. رۆمییەکان لەبەهار گەڕانەوە و ئاگری جەنگێکی تازەیان هەڵگیرساند و ئەم جارەیش سەرکەوتن بەموسوڵمانان بڕا. موسوڵمانان لەساڵی ٨٢٥/٢٢٠ زایینی بەفەرماندەیی محەممەد کوڕی عەبدوالله هێرشیان کردە سەر قەسریانە و لەوێ، رۆمییەکان رووبەروویان بوونەوە بەلاّم سوپاکەیان شکستی خوارد و ژن و مناڵەکانی بەتریرك گرفتار بوون. موسوڵمانان تالاّنییەکانی ئوردووگاکەیان کۆکردەوە بۆ بەلەرم گەڕانەوە.

دواتر محەممەد کوڕی عەبدوالله سوپایەکی بۆ تەبەرمین ڕەوانە کرد. محەممەد کوڕی سالم فەرماندەی ئەم سوپایە بوو. لەم جەنگەدا محەممەد کوڕی ساڵم تالاّنی زۆری دەستکەوت بەلاّم دەستەیەك لەسوپاکەی شۆڕشیان کرد و هێرشیان کردە سەر کوڕی ساڵم و خوێنیان ڕشت و پەیوەستی سوپای رۆم بوون.

زیادەالله لەئەفریقییەوە، فەزڵ کوڕی یەعقوبی لەجیاتی ئەو نارد. فەزڵ لەگەڵ سوپایەك هێرشی کردە سەر سیراکوز. سوپاکەی تالاّنییەکی زۆری دەستکەوت و گەڕانەوە. دوای ئەوان، سوپایەکی دیکە هاتن و ئەوانیش تالاّنی زۆریان کۆکردەوە و گەڕانەوە بەلاّم بەتریق فەرمانڕەوای سیسیل بەسوپایەکی گەورە ڕێگەی گەڕانەوەی ئەوانی گرت. موسوڵمانان بەناچاری لەشوێنێکی دژوار و داپۆشراو بەدار، پەنایان گرت. بەمشێوەیە بەتریق نەیتوانی بجەنگێت. ئەو لەبەرەبەیانەوە تا ئێواریێ چاوەنواری ئاشکرا بوونی موسوڵمانانی دەکرد بەلاّم چوونکە ئەوانی نەبینی، گەڕایەوە و سوپاکەی بلاّوەیان لێکرد.

موسوڵمانان کاتێك بارودۆخی شلەژاوی ئەوانیان بینی، هێرشیان کرد و

ڕۆمییەکان هەڵاتن. بەتریق لەچەندین جێگەوە بریندار بوو و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. پارێزەرەکانی جەستەی برینداری ئەویان هەڵگرت و بردیان. موسوڵمانان کەرەستەکانی جەنگ و چوارپێکانی ئەوانیان وەك تالآنی بۆ مایەوە. پانتایی ئەم جەنگە فراوان بوو.

زیادەالله، باوکی ئەغلەب، ئیبراهیم کوڕی عەبدوڵڵەی وەك فەرمانڕەوای سەقەلییە (سیسیل) ڕەوانە کرد. ئەو لەنیوەی ڕەمەزان/٥ ئاوریلی ئەم ساڵە گەیشتە ئەم دوورگەیە. باوکی ئەغلەب هێزی دەریایی خۆی بۆ جەنگ لەگەڵ هێزی دەریایی ڕۆمییەکان ڕەوانە کرد. موسوڵمانان دەستیان بەسەر سامانی ڕۆمییەکاندا گرت و باوکی ئەغلەب هەموو کەسانی ناو کەشتییەکانی سەربڕی. چەندین کەشتی جەنگی دیکەی بۆ قەوسەرە نارد. دەستی بەسەر کەشتییەکدا گرت کەچەندین ڕۆمی وپیاوێکی لەدین هەڵگەڕاوە کەباوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنابوو، لەناو کەشتییەکەدا بوون. سەری هەموویانی بڕی. دەستەیەکی دیکە لەسەربازەکان ڕوویان کردە کوێستانەکانی نار و کەنارەکانی ئەو سەرزەمینە، کێڵگە و مەزراکانیان سوتاند و تالآنییەکانیان کۆکردەوە و خوێنی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانیان ڕشت.

باوکی ئەغلەب لەساڵی ٨٣٦/٢٢١ زایینی بۆ جارێکی دیکە دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بۆ کێوەکانی نار نارد. سوپاکەی تالآنییەکی فراوانیان کۆکردەوە بەشێوەیەك کۆیلەکانیان بەهەرزانترین بەها فرۆشت و تەندروست گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا باوکی ئەغلەب سوپایەکی بۆ قەستەلیاسە ڕەوانە کرد. تالآنی زۆریان دەستکەوت و ژمارەیەکی زۆریان دیل کرد بەلآم لەگەڵ ئەوەیشدا دوژمن خۆڕاگری کرد و ڕۆمییەکان پشتیوانیان بوون.

لەم ساڵەدا باوکی ئەغلەب دەستەیەکی بۆ قەسریانە ڕەوانە کرد. دوژمن خۆڕاگری کرد و شەڕێکی خوێناوی هەڵگیرسا. موسوڵمانان شکستیان خوراد و دەستەیەکیان بریندار بوون.

دواتر جەنگێکی دیکە لەنێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان ڕوویدا و ڕۆمییەکان

لەم جەنگەدا شکستیان خوارد و موسوڵمانان دەستیان بەسەر نۆ کەشتی جەنگی ئەواندا گرت. لەم جەنگەدا خەڵکانی قەسریانە گەمارۆیان خرایەسەر تا ئەوەی لەیەکێك لەشەوەکانی زستان پیاوێك لەموسوڵمانان رێگەیەکی دۆزییەوە و بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت ڕۆشتە ناو شارەکە. دواتر گەڕایەوە و رێگەکەی نیشان سوپاکەدا. موسوڵمانان لەم رێگەوە ڕۆشتنە ناو شارەکە و دەنگی تەکبیریان بەرز کردەوە. رۆمییەکان پەرێشان و شڵەژاو پەنایان بۆ قەڵاکە برد و داوای ئەمانیان کرد. موسوڵمانان ئەمانیان پێ بەخشین و تالانی زۆریان بەدەست هێنا و بۆ بەلەرم گەڕانەوە.

لەساڵی ٨٣٨/٢٢٣ زایینی ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکان لەرێگەی دەریاوە خۆیان گەیاندە سیسیل (سەقەلییە). لەو کاتەدا موسوڵمانان دەستیان بەسەر قەڵای جفلوزیدا گرتبوو. گرتنی ئەم قەڵایە زۆری خایاند. کاتێك رۆمییەکان گەیشتن، موسوڵمانان پاشەکشێیان کردو و لەنێوان ئەوان و ئەو رۆمییانەی تازەی هاتبوون، چەندین شەڕ روویدا. لەکاتی جەنگەکان هەواڵی مەرگی زیادەالله کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە گەیشت. موسوڵمانان سەرەتا ورەی خۆیان دۆڕاند بەڵام دواتر هێز و ورەی خۆیان بەدەست هێنایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی محەممەد هەڵبژێردراوی باوکی سەرایا، مرد. ( ئەوی بۆ خەلافەت هەڵبژاردبوو)

هەروەها لەم ساڵەدا خەڵکانی خوراسان، ئیسفەهان و ڕەی گرفتاری وشکەساڵییەکی دژوار بوون و ژمارەیەکی زۆریان لەبرسانا مردن.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی دەیەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

# پێرست

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و دووی کۆچی ( ٨١٧ زایینی )

## بەیعەتی ئیبراهیم کوڕی مەهدی

لەم ساڵەدا خەڵکانی بەغداد بەخەلافەتی ئیبراهیم کوڕی مەهدی رازی بوون و نازناوی موبارەکیان پێ بەخشی. ئەم بەیعەتە لەیەکەم ڕۆژی موحەرەم /١٨ ژوئیەی ئەنجامدرا. دەستەیەك ئەم پێشهاتە دەگێڕنەوە بۆ ڕۆژی پێنجی ئەم مانگە. ئەوان مەئمونیان لەسەر کار لابرد و منداڵەکانی دیکەی هاشم، دەستی بەیعەتیان بۆ ئیبراهیم درێژ کرد. موتەلیب کوڕی عەبدوالله کوڕی مالك هەڵسوڕێنەری کاروباری ئەم بەیعەتە بوو. ئەوانەی بۆ وەرگرتنی ئەم بەیعەتە پێداگرییان دەکرد، بریتی بوون لە: سندی، ساڵحی پێشنوێژ، نۆسەیر و وەسیف و دەستەیەکی دیکە کە لەمەئمون نارازی و توڕە بوون چوونکە مەئمون دەیویست خەلافەت لەمنداڵەکانی عەباس وەربگرێتەوە و جل و بەرگی ڕەشی باوکانی فرێبدات. ( ئیمامی شیعەکان، ڕەزای وەك جێگری خۆی دیاریکرد و ڕەنگی سەوزی ئێرانییەکانی لەجێگەی ڕەنگی ڕەش هەڵبژارد. )

کاتێك بەیعەتیان بۆ ئیبراهیم وەرگرت، مزگێنی موچەی شەش مانگی بەسوپاکەیدا بەڵام لەدانی ئەو پارەیە خۆی دوادەخست و لەبەر ئەمە سوپاکە، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئیبراهیم بەناچاری دووسەد درهەمی بەهەر سەربازێکدا و بۆ دەستەیەکیان بەئەندازەی دووسەد درهەم پسولەی وەرگرتنی گەنم و جۆی لەکێڵگەکانی عێراق دەرکرد. ئەوان بۆ وەرگرتنی گەنم و جۆ بڵاو بوونەوە و سامانی خەڵکانیان تالان کرد بەواتایەکی دیکە بەشی حکومەت و خەڵکیان برد. ئیبراهیم دەستی بەسەر کوفە و شارەکانی دیکە گرت و لەمەدائین ئوردووی لێدا و عەباس کوڕی موسای هادی وەك فەرمانداری ڕۆژهەڵات و ئیسحاق کوڕی موسای هادی وەك فەرمانداری ڕۆژئاوا دیاریکرد.

لەم کاتەدا مەهدی کوڕی عولوانی حروری لەخەواریج دژی ئەو ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستی بەسەر گوندەکانی دەوروبەری ڕوبارەی بۆق و ڕەزانین، گرت. ئیبراهیم، باوکی ئیسحاق کوڕی ڕەشیدی (موعتەسەم) لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی دیکە بۆ سەرکوت کردنی ئەو ڕەوانە کرد. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی

یەکبوونەوە و جەنگێکی قورس دەستی پێکرد. یەکێك لەسوپای خەواریج ڕمەکەی بۆ ئیسحاق کوڕی ڕەشید هاویشت بەڵام کۆیلەیەکی تورك کە بەئەشناس ناودەبرا، خۆی کردە قەڵغان و سەرئەنجام مەهدی، تێکشکاو بۆ حەولایا هەڵات. دەستەیەك دەڵێن مەهدی لەساڵی ٢٠٣/ ٨١٨ زایینی شۆڕشی کرد.

## زاڵبونی ئیبراهیم بەسەر کۆشکی هوبەیرە

حومەید کوڕی عەبد حەمید کارگوزاری حەسەن کوڕی سەهل لەکۆشکی کوڕی هوبەیرە دەژیا. دەستەیەك لەسەرکردەکانی حومەید: سەعید کوڕی ساجور، باوکی بەت، غەسان کوڕی باوکی فەرەج و محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ئەفریقی (خیانەتکار) نامەیان بۆ ئیبراهیم نووسی تا کۆشکی کوڕی هوبەیرە بەو بسپێرن. ئەم دەستەیە خۆیان لەحومەید دوور خستبوویەوە و هەواڵەکانیان بۆ حەسەن کوڕی سەهل دەنارد کەحومەید نامە بۆ ئیبراهیم دەنێرێت و حومەیدیش هاوشێوەی ئەم هەواڵانە بۆ حەسەن کوڕی سەهل ڕەوانە دەکات. حەسەن نامەیەکی بۆ حومەید نووسی و ئەوی بۆ بارەگاکەی خۆی بانگ کرد بەڵام حومەید لەترسی ئەوەی نەکا ئەم سەرکردانە لەنەبوونی خۆی دەست بەسەر سامان و سەربازەکانیدا بگرن و تەسلیمی ئیبراهیمی بکەن، لەڕۆشتن خۆی بەدوور گرت بەڵام چوونکە نامە یەك لەدوای یەکەکانی حەسەنی بەدەست دەگەیشت، بەناچاری لەرەبیع الاخر/ ئۆکتۆبەر ڕێگەی بارەگای حەسەنی گرتەبەر. ئەم سەرکردانە نامەیان بۆ ئیبراهیم نووسی و داوایان لێکرد عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالید بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکات. ئیبراهیم، عیسای ڕەوانە کرد و هەموو سامانەکانی ئوردووی حومەیدیان تالاّن کرد کەتەنیا یەکیان سەد هەنبانە زێر بوو. کوڕەکەی حومەید کەنیزەکانی باوکی هەڵگرت و بەرەو ئوردووگای حەسەن کوڕی سەهل بەڕێکەوت. عیسا ڕۆشتە ناو کۆشکەکە و لەدەی ڕەبیع الثانی/ ٢٥ ئۆکتۆبەر، دەستی بەسەردا گرت. حومەید بەحەسەن کوڕی سەهلی وت: مەگەر بەتۆم نەوت؟ (ئەوان خیانتکارن) بەڵام دووبارە فریوت خوارد.

حومەید بۆ کوفە گەڕایەوە و سامانەکانی خۆی هەڵگرت و عەباس کوڕی موسا

کوڕی جەعفەری عەلەوی وەك فەرمانداری ئەو ناوچەیە دیاریکرد و فەرمانی پێدا دوای مەئمون خەڵکان بۆ بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی موسای ڕەزا (کەوەك جێگری مەئمون دیاریکرابوو) هان بدات و سەد هەزار درهەمی پێدا و وتی: لەرێگەی براکەت بجەنگە و دڵنیابە خەڵکانی کوفە و من هاوکاریت دەکەین.

بۆ شەوەکەی، حومەید بۆ لای حەسەن گەڕایەوە. حەسەن، حەکیمی حارسی بەرەو نیل (جیاواز لەڕووباری نیلی میسر) ڕەوانە کردبوو. ئەو بۆجەنگی عیسا کوڕی محەممەد ڕۆشت و لەنێوان دوو سوپاکە جەنگ هەڵگیرسا. لەم جەنگەدا حەکیم شکستی خوارد و عیسا ڕۆشتە ناو ئەو سەرزەمینە. دوای ئەوە ئیبراهیمی خەلیفە، سەعید و باوکی بەتی بۆ جەنگ دژی عەباس کوڕی موسا ڕەوانەی کوفە کرد. عەباس داوای هاوکاری لەخەڵکانی کوفە کرد و دەستەیەکیان پەیوەستی کوفە بوون.

شیعەکان پێیان وت: ئەگەر تەنیا پێشنیاری بەیعەتی براکەتمان پێدەکەیت، هاورێیەتی دەکەین بێ ئەوەی پێویستمان بەمەئمون بێت. عەباس کوڕی موسا وتی: سەرەتا پێشنیاری بەیعەتی مەئمونتان پێدەکەم و دواتر براکەم. بەمشێوەیە ئەوان هاوکارییان نەکرد.

کاتێك سەعید و باوکی بەت، بۆ گرتنی عەباس کوڕی موسا هاتن و لەگوندی شاهی ئوردوویان لێدا، عەباس، کوڕە مامەکەی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی جەعفەری ( کەبۆ باوکی لەمەککە بەیعەتی وەرگرتبوو) لەگەڵ دەستەیەکی وەك برای باوکی سەرایا بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. دوو سوپا چەند جارێك ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سەرئەنجام عەلی کوڕی محەممەدی عەلەوی و خەڵکانی کوفە شکستیان خوارد و سەعید هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی لەدووەمی جومادی الاول، ١٧ ئۆکتۆبەر لەحیرە دابەزین و پێشڕەوییان کرد و ئاگری جەنگیان دژی خەڵکانی کوفە خۆش کرد. هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی عەباس و موالییەکانیان و تا ئاوابوونی خۆر، درێژەیان بەجەنگدا. ئەوان هاواریان دەکرد: ئەی باوکی ئیبراهیم! ئەی مەنسور! نابێت گوێڕایەڵی فەرمانی مەئمون بین. ئەم دەستەیە جل و بەرگی ڕەشیان لەبەردا بوو و خەڵکانی کوفە جل و بەرگی سەوز.

بەیانی ئەو ڕۆژە جەنگ دەستی پێکردەوە و هەر دوو سوپا هەرچییان دەستدەکەوت، یا دەیانسوتاند یا دەیانڕفاند. کاتێك سەرکردەکانی کوفە ئەمەیان بینی، ڕۆشتنە لای سەعید و داوای ئەمانیان بۆ خۆیان و هاوەڵانیان کرد. سەعید لەسەر ئەو بنەمایە ئەمانی پێبەخشین کە لەکوفە بڕۆنەدەر. سەرکردەکان ڕازی بوون.. ئەوان عەباسیان لەم گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە. عەباسیش لەبەردەم ئەم ڕێکەوتنە سەری دانەواند و لەماڵەکەی ڕۆشت. هاوەڵانی عەباس کوڕی موسا هێرشیان کردە سەر پاشماوەی هاوەڵانی سەعید و دژی ئەوان جەنگان. هاوەڵانی سەعید پەنایان بۆ خەندەکەکان برد و سەربازەکانی عەباس، ماڵەکانی عیسا کوڕی موسایان تاڵان کرد و هەرکەسیان گرت، کوشتیان یا گریان تێبەردا.

عەباسییەکان پەیکیان بۆ لای سەعید لەحیرە نارد ولەپەیمان شکێنی عەباس کوڕی موسا ئاگاداریان کردەوە. سەعید و هاوەڵانی هێرشیان کردە سەر کوفە و لەتاریکایی شەو گەیشتنە ئەو شارە و هەموو تاڵانچییەکانیان کوشت و تاڵانییەکانی ئەوانیان کردە خۆراکی ئاگر. سەعید و هاوەڵانی بەشی زۆری شەو چاوەڕوان مانەوە تا ئەوەی سەرکردەکانی کوفە ڕۆشتن و وتیان ئەم پێشهاتە بەهۆی ئاژاوەچییەکانەوە سەری هەڵداوە و عەباس ڕێزی لەئەمان نامەکەی خۆی گرتووە. بەمشێوەیە سەعید دەستی لەشوێن هەڵگرتنی عەباس هەڵگرت.

بۆ بەیانی سەعید و باوکی بەت ڕۆشتنە ناو کوفە و بانگی ئەمانیان بەرز کردەوە و زیانیان لەکەس نەدا. فەزڵ کوڕی محەممەد کوڕی سەباحی کێندیان وەك فەرمانداری شارەکە دەستنیشان کرد بەڵام دواتر ئەویان لەبەر کۆکردنەوەی زیاد لەرادەی سامان بۆ خۆی، لەسەر تەخت هێنایە خوار و غەسان باوکی فەرەجییان لەجێگەی ئەو دانیشاند. دواتر ئەویشیان بەگوناحی ئەوەی دەستی بەخوێنی باوکی عەبدوڵڵە برای باوکی سەرایا، پیس بووە لەسەر کار لابرد و باوکی هەول، برازای سەعیدیان لەجێگەی ئەو دانا. باوکی هەول فەرمانڕەوایەتی کوفەی دەکرد تا حومەید کوڕی عەبد حەمید لەگەڵ سوپاکەی ڕژانە ناو کوفە و باوکی هەول بەناچاری هەڵات.

ئیبراهیم کوڕی مەهدی (خەلیفە)، فەرمانی بەعیسا کوڕی محەممەد دا لەڕێگەی

نیلەوە بەرەو کەنارەکانی واست بڕوات و بەکوڕی عایشەی هاشمی و نوعەیم کوڕی حازم و دوای ئەوان بەسەعید و باوکی بەتی ئەفریقیای، فەرمانیدا هەموویان لەسیادە لەنزیکی واست ئوردوو لێبدەن. فەرماندەی هەموویان عیسا کوڕی محەممەد بوو. سوپاکەی ئەو هەموو ڕۆژێك هێرشیان دەکردە سەر ئوردووی حەسەن بەڵام ئەوان لەناو شارەکەدا سەنگەریان گرتبوو و کەس بۆ جەنگی ئەمان نەدەهاتەدەر.

سەرئەنجام حەسەن فەرمانی بەسەربازەکانیدا هێرشیان بکەنەسەر. ئەوان لەبیست و شەشی ڕەجەب/ ٦ فەوریە هێرشیان کردە سەر هێزەکانی ئیبراهیم و تا نیمەڕۆ جەنگێکی سەرسوڕهێنەریان تاقی کردەوە و لەکۆتاییدا عیسا و سوپاکەی هەڵاتن و ڕێگەی تەریانا و نیلیان گرتەبەر. حەسەن دەستی بەسەر ئوردووەکەی ئیبراهیم و سامانی سوپاکەیدا گرت.

## سەرکەوتن بەسەر سەهل کوڕی سەلامە

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی مەهدی سەرکەوتنی بەسەر سەهل کوڕی سەلامە بەدەست هێنا کەڕێبەری خۆبەخشەکان بوو. ئەوی زیندانی کرد و سزایدا.

چۆنیەتی سەرکەوتنی ئیبراهیم بەم شێوە بوو کەسەهل لەبەغداد مابوویەوە و پێشنیاری فەرماندان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپەی بەخەڵکی شارەکە دەکرد. زۆرینەی خەڵکانی بەغداد لەدەوری کۆبوونەوە. کاتێك عیسا کوڕی محەممەد شکستی خوارد، لەگەڵ سوپاکەی ڕووبەڕووی سەهل کوڕی سەلامە بوویەوە بۆ ئەوەی سەرکوتی بکات چوونکە سەهل بەردەوام عیسای بەکەسێکی خراپەکار ناوزەد دەکرد و بەستەمکاری لەقەڵەم دەدا. دوو سوپا بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ جەنگان. بەدوای ئەم جەنگانە سوپاکەی سەهل لەهەر گەڕەك و کۆڵانێك سەنگەریان گرت. عیسا درهەم و دیناری فراوانی لەناو سوپاکەی سەهل بڵاو کردەوە و ئەوانیش ڕێگەکانیان بۆ کردەوە.

لەڕۆژی شەممە بیست و پێنجی شەعبان/ ٧ مارسی ٨١٧ زایینی، عیسا و سوپاکەی لەهەموو ناوچەکانەوە هێرشیان کردە سەر سەهل. سەربازەکانی سەهل

چوونکە پارەیان لەعیسا وەرگرتبوو، هاوکارییان نەکرد تا ئەو جێگەی عیسا خۆی گەیاندە ماڵەکەی سەهل بەڵام سەهل خۆی خستە ناو بینەران و خۆی شاردەوە. عیسا ئەوی لەماڵەکەیدا نەبینی. بۆ گرتنی ئەو چەندین کەسیان راسپارد. سەهل لەشەودا گیرا و بردیانە لای ئیسحاق کوڕی هادی. ئیسحاق پرسیاری لێکرد و سەهل لەوەڵامدا وتی: پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ منداڵەکانی عەباسم بەخەڵکان دەدا و داوم لێدەکرد لەسەر بنەمای قورئان و سونەتی پێغەمبەر(د.خ) هەڵس و کەوت بکەن، هەنووکە ئەو پێشنیارەیش بەئێوە دەکەم. پێیان وت: برۆ ناو خەڵکان و پێیان بڵێ ئەوەی پێشنیارت دەکرد، تەنیا قسەی هەڵبەستراوە بووە. ئەو رۆشتە ناو خەڵکان و بەمشێوەیە زمانی کردەوە: ئەی خەڵکینە! دەزانن پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەند و سونەتی پێغەمبەرم(د.خ) پێدەکردن، هەنووکەیش لەسەر پێشنیارەکەی خۆم پێداگری دەکەم. راسپێردراوان ئەویان گرت و ئەشکەنجەیاندا، جوێنیان پێدا و ئەویان بۆ لای ئیبراهیم کوڕی مەهدی لەمەدائن رەوانە کرد. کاتێك سەهل رۆشتە بارەگاکەی، ئەو قسانەی لەگەڵ ئیسحاق کوڕی هادی کردبووی، دووبارەی کردەوە. ئیبراهیم ئەشکەنجەیدا و زیندانی کرد. ئیبراهیم وای نیشاندا کەئەوی کوشتووە. ئەو ئەم هەواڵە درۆیەی بڵاو کردەوە لەبەر ئەوەی نەکا خەڵکان جێگەی ئەو بدۆزنەوە و لەزیندان ئازادی بکەن. لەکاتی سەر بەرز کردنەوەی سەهل تا هاتنە خوارەوەی لەسەر تەخت دوانزە مانگی خایاند.

## رۆشتنی مەئمون بۆ عێراق و کوشتنی زوریاستین

لەم ساڵەدا مەئمون لەمەرو رێگەی عێراقی گرتەبەر و غەسان کوڕی عوبادەی وەك جێگری خۆی لەخوراسان دیاری کرد.

هۆکاری رۆشتنی ئەو بۆ عێراق، بەسەرهاتی عەلی کوڕی موسای رەزا بوو. لەسەر بنەمای ئەم گێڕانەوەیە دوای کوشتنی ئەمین ئاژاوە و کوشت وکوشتار لەناو خەڵکانی عێراق گەشەی کرد و چەندین بارودۆخی دژوار هاتەپێش کەفەزڵ کوڕی سەهل ئەم پێشهاتانەی لەو دەشاردەوە و خەڵکان لەوەی ئەو لەم پێشهاتانە ئاگادار نەدەبوویەوە، نیگەران و پەرێشان بوون. ئەویان بەشێت لەقەڵەم دەدا و بەیعەتیان

لەگەڵ ئیبراهیم کوڕی مەهدی بەست. مەئمون بەعەلی کوڕی موسای رەزای وت: خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ ئیبراهیم نەکردووە بەڵکو بەوشێوەی فەزڵ دەڵێت، ئەویان وەك فەرمانڕەوای خۆیان دەستنیشان کردووە تا کاروبارەکانیان هەڵسوڕێنێت. عەلی کوڕی موسای رەزا وتەکانی فەزڵی بەناڕاست زانی و مەئمونی لەجەنگی نێوان حەسەن کوڕی سەهل و ئیبراهیم ئاگادار کردەوە و پێی وت: خەڵکان کینەی تۆیان لەدڵ گرتووە لەبەر ئەوەی ئەم پێگەت بەو و براکەی بەخشیوە و منت کردۆتە جێگری خۆت.

مەئمون بەعەلی کوڕی موسای رەزای وت: جگە لەتۆ چ کەسێك ئەمانە دەزانێت؟ عەلی کوڕی موسای رەزا وتی: یەحیا کوڕی موعاز، عەبدولعەزیز کوڕی عیمران و سەرکردەکانی سوپا. مەئمون فەرمانیدا هەموویان لەبارەگاکەی ئامادە بن. هەموویان ئامادە بوون و مەئمون سەبارەت بەقسەکانی عەلی کوڕی موسای رەزا پرسیاری لێکردن. ئەوان زمانیان نەکردەوە تا ئەوەی مەئمون لەلایەن فەزڵەوە ئەمانی پێبەخشین و بەڵێنیدا رێگە نەدات لەلایەن فەزڵەوە ئازار و زیانیان پێ بگات. بەمشێوەیە ئەوانیش بەیعەتی ئیبراهیم کوڕی مەهدییان بۆ مەئمون پشتراست کردەوە و وتیان خەڵکانی عێراق ئەو بەخەلیفەی سوننی (ئەو کەسەی رێگەی سونەتی پێغەمبەر(د.خ) دەگرێتەبەر) و مەئمون بە (فضی)[1] ناو دەبەن چوونکە عەلی کوڕی موسای وەك جێگری دەستنیشان کردووە. ئەوان مەئمونیان لەبارودۆخی خەڵکان ئاگادار کردەوە و لەتۆمەت و بوختانەکانی فەزڵ بۆ هەرسیمە ئاگاداریان کردەوە کەچاکەخوازی ئەوی لەسەردا پەروەردە دەکرد و فەزڵ خوێنی ڕشت. مەئمونیان ئاگادار کردەوە ئەگەر کاروبارەکان سامان نەدات، خەلافەت لەدەست دەدات. هەروەها پێیان وت تاهیر کوڕی حسەین بۆ فەرمان بردن لەمەئمون ئەزمونێکی باشی لەخۆی نیشانداوە و فەزڵ ئەوی لەکاروبارەکان و بۆ شوێنێکی دووردەست، دووری خستۆتەوە بەشێوەیەك چیتر کەس چاوەڕوانی هاوکارییەکانی ئەو ناکات. بەکورتی ئەوەی پێگەی مەئمون لەبەغداد دابەزیوە و سوپاییەکان ئاڵای

---

[1] نازناوێکە بۆ سەرکۆنە کردن کەزیاتر شوێنکەوتەکانی مەزهەبی سوونە بۆ سەرکۆنە کردنی شیعەکان بەکاری دەبەن.

شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە لەکاتێکدا ئەگەر تاهیر لەبەغداد دەمایەوە، دەیتوانی پێگەی خەلافەتی مەئمون بپارێزێت و جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست. ئەوان داوایان لەمەئمون کرد بەرەو بەغداد بڕوات چوونکە ئەگەر خەڵکانی بەغداد ببینن، فەرمانبردای و گوێرایەڵی خۆیان نیشان دەدەن.

لەم کاتەدا مەئمون فەرمانی ئامادە بوونی دەرکرد. فەزڵ لەم گفتوگۆیە ئاگادار بوویەوە و ژمارەیەك لەوانی گرت و زیندانی کردن و ریشی چەند کەسێکی هەڵکەند. عەلی کوڕی موسای ڕەزا مەئمونی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. مەئمون وتی: هێشتا نامەوێت لەگەڵ فەزڵ ناسازگاری بکەم. بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە سەرەخس، دەستەیەك دژی فەزڵ کوڕی سەهل شۆڕشیان کرد و لەگەرماودا کوشتیان. ئەم پێشهاتە لەدووەمی مانگی شەعبان/ ١٢ فەوریەی ٨١٧ زایینی روویدا. چوارکەس خوێنی فەزڵیان ڕشت: غالیب مەسعودی ئەسەدی و قوستەنتینی رۆمی و فەرەجی دەیلەمی و موەفەقی سەقلەبی. ساڵەکانی ژیانی لەشەست کۆتایی هات. ئەم کەسانە ئەویان کوشت و هەڵاتن. مەئمون بۆ گرتنی ئەم کەسانە دەهەزار دیناری وەك خەڵات دیاریکرد. عەباس کوڕی هەیسەمی دەینەوەری ئەوانی گرت و ڕەوانەی بارەگای مەئمونی کرد. بەمەئمونیان وت: تۆ فەرمانی کوشتنی ئەوت بەئێمەدا. مەئمون فەرمانیدا و سەری هەر چواریان لەجەستە جیا کردەوە.

دەڵێن: لەکاتی پرسیار کردنی مەئمون لەچەند و چۆنیەتی ئەم روداوە دەستەیەك وایان نیشاندا کەعەلی کوڕی باوکی سەعید خوشکەزای فەزڵ کوڕی سەهل ئەوانی بۆ ئەم کارە هەڵخراندووە و دەستەیەك حاشایان لەم فەرمانە کرد. بەرهەحاڵ مەئمون ئەوانی کوشت و دواتر لێکۆڵینەوەی لەگەڵ عەبدولعەزیز کوڕی عیمران و عەلی و موسا و ژمارەیەکی دیکە کرد بەڵام هەمووان بێ ئاگایی خۆیان لەم پێشهاتە نیشاندا. مەئمون بەوەڵامەکانیان رازی نەبوو و فەرمانی کوشتنی هەموویانی دەرکرد. سەری ئەوانی بۆ لای حەسەن کوڕی سەهل نارد و پێی وت لەمەرگی فەزڵ خەمبارە و هەنووکە پێگەی براکەی بەو بەخشیوە. ئەم هەواڵانە لەمانگی ڕەمەزان/ مارسی ٨١٧ زایینی بەحەسەن کوڕی سەهل گەیشت.

مەئمون ڕێگەی عێراقی گرتەبەر. لەو کاتەدا ئیبراهیم کوڕی مەهدی و عیسا و ژمارەیەکی دیکە لەمەدائن بوون و باوکی بەت و سەعید، شەو و ڕۆژ لەکەنار نیل سەرقاڵی جەنگ بوون. موتەلیب کوڕی عەبدوالله کوڕی مالك لەمەدائن گەڕایەوە و خۆی بەنەخۆش نیشاندا. ئەو بەشێوەیەکی نهێنی پێشنیاری بەیعەتی مەئمونی بەخەڵکان دەکرد و مەنسور کوڕی مەهدی وەك جێگری ئەو دەناساند و بۆ لەسەر کار لابردنی ئیبراهیم هەوڵی دەدا. مەنسور کوڕی مەهدی و خوزەیمە کوڕی خازم و چەند سەرکردەیەکی دیکە بەوتەکانی ڕازی بوون. موتەلیب نامەی بۆ عەلی کوڕی هوشام و حومەید نووسی تا پێشڕەوی بکەن. حومەید لەکەنار ڕووباری سەرسەڕ دابەزی و عەلی لەکەناری نەهرەوان.

کاتێك ئیبراهیم کوڕی مەهدی ئەمەی زانی و لەمەدائنەوە ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەنیوەی سەفەر/ یەکی سێپتامبەری ٨١٧ زایینی لەزەندوەرد دابەزی و کەسی بەدوای موتەلیب و خوزەیمەدا نارد بۆ ئەوەی لەبارەگاکەی ئامادەبن بەڵام ئەوان خۆیان دوا دەخست. کاتێك ئیبراهیم ئەمەی بینی، عیسای بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد. مەنسور و خوزەیمە ڕێگەی سازگارییان گرتەبەر بەڵام موتەلیب ڕێگەی سازانی لەکەسەکان و موالییەکانی خۆی گرت. جارچی ئیبراهیم جاڕیدا: هەرکەس خوازیاری بەدەست هێنانی تاڵانییە، ڕووبکاتە ماڵی موتەلیب. بۆ نیمەڕۆ، تاڵانچییەکان گەیشتنە ماڵی موتەلیب و هەموو سامانەکەیان تاڵان کرد و ماڵی خزمەکانی ئەویشیان تاڵان کرد بەڵام خودی ئەویان نەگرت. ئەم ڕووداوە لەحەڤدەی مانگی سەفەر/ ٢٢ سێپتامبەری ٨١٧ زایینی پێشهات. کاتێك هەواڵی ئەم ڕووداوە بەحومەید و عەلی کوڕی هوشام گەیشت، حومەید خۆی گەیاندە مەدائین و پردەکەی وێران کرد و لەوێ مایەوە. ئیبراهیم لەکردەکەی خۆی لەگەڵ موتەلیب پەشیمان بوویەوە و چیتر ئەوی بەدەست نەهێنا.

## چۆنیەتی کوژرانی عەلی کوڕی حسەینی هەمەدانی

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی حسەینی هەمەدانی و براکەی ئەحمەد و ژمارەیەك لەکەسەکانی کوژران. عەلی کوڕی حسەین دەستی بەسەر موسڵدا گرتبوو.

چۆنیەتی کوژرانەکەی بەمشێوە بوو: رۆژێك لەگەڵ دەستەیەك لەکەسەکانی خۆی و ژمارەیەك لەخەڵکانی ئەزد هاتنە ناو مێرگەلاَنەکانی نەینەوا. ئەو بەبینینی ئەم زەوییە سەرسەوزە وتی: ئەم سەرزەمینە بۆ یەك کەس بەسە. یەکێك لەخەڵکانی ئەزد وتی: ئەی ئێمە چی بکەین؟ عەلی کوڕی حسەین وتی: ئێوەیش رێگەی عەممان بگرنەبەر. ئەم وتەیە لەناو خەڵکان بلاَو بوویەوە. عەلی کوڕی حسەین پیاوێك لەئەزدییەکان بەناوی عەون کوڕی جەبەلەی بەزیندووی خستە ناو دیوارێك و ئەو پیاوە گیانی ئەسپەردە کرد. هەواڵی ئەم کوشتنە بلاَو بوویەوە. بەمشێوەیە خەڵکانی ئەزد بەفەرماندەیی سەیید کوڕی ئەنس هێرشیان کردە سەر عەلی کوڕی حسەین. عەلی کوڕی حسەین لەپیاوێکی خەواریج بەناوی مەهدی کوڕی عیلوان، داوای هاوکاری کرد و ئەو پیاوە هاوکاری کرد. مەهدی لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند و پێشنیاری کۆبوونەوە و پەیوەست بوون بەسوپاکەی پێکردن و بەمشێوەیە ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. دەرئەنجامی ئەم جەنگە لەزیانی عەلی کوڕی حسەین و هاوەڵانی ئەو (مەهدی) بوو و بەناچاری نەینەوای بەجێهێشت و رێگەی حودەیسەی گرتەبەر. خەڵکانی ئەزد شوێنی کەوتن و خوێنی عەلی کوڕی حسەین و ئەحمەدی برای و ژمارەیەك لەکەسەکانیان ڕشت. براکەی دیکەی بەناوی محەممەد رێگەی بەغدادی گرتەبەر و گیانی خۆی رزگار کرد. خەڵکانی ئەزد بۆ موسڵ گەڕانەوە و سەیید کوڕی ئەنس دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ مەئمونی بەخەڵکان کرد و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی مەئمون نیشاندا.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا مەئمون لەگەڵ پوران کچی حەسەن کوڕی سەهل پەیوەندی هاوسەرگیری بەست.

لەم ساڵەدا مەئمون کچەکەی خۆی دایکی حەبیبی کردە هاوسەری عەلی کوڕی موسای رەزا و کچەکەی دیکەی، دایکی فەزڵی وەك هاوسەری محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسای رەزا دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی موسا کوڕی جەعفەر ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو براکەی وەك جێگری مەئمون دەناساند. ئەو دوای حەج ڕێگەی یەمەنی گرتەبەر چوونکە حەمدویە کوڕی عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرتبوو.

لەرەبیع الاخری ئەم ساڵە/ ئۆکتۆبەر لەشەوی چواردەی رەبیع الاخر/ ٢٩ ئۆکتۆبەر شێوەیەك سووری لەئاسمان دەرکەوت و دوای ماوەیەك دیاری نەما و دوو کۆڵەکەی (ستوون) سوور تا بەرەبەیان بەئاسمانەوە دیار بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی محەممەد یەحیا کوڕی موبارەك کوڕی موغەیرەی عەدەوی یەزیدی قورئان خوێن و هاوڕێی باوکی عەمرۆ کوڕی عەلا، کۆچی دوایی کرد. پێیان دەوت یەزیدی چوونکە هاونشینی یەزید کوڕی مەنسور خاڵی مەهدی بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا سەهل باوکی زوریاستین، شەش مانگ دوای کوژرانی کوڕەکەی مرد بەڵام دایکی مایەوە تا ئەو کاتەی زەماوەندی هاوسەرگیری بورانی کوڕەزای بینی.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سێی کۆچی ( ٨١٨ زایینی )

### مردنی عەلی کوڕی موسای ڕەزا

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی موسای ڕەزا کۆچی دوایی کرد. چۆنیەتی مەرگی ئەو بەمشێوە بوو:ترێی زۆری خوارد و لەناکاو مرد. مردنی ئەو لەکۆتایی مانگی سەفەر/ یەکی سێپتامبەری ٨١٨ زایینی ڕوویدا. عەلی کوڕی موسای ڕەزا لەشاری توسماڵئاوایی لەجیهان کرد. مەئمون نوێژی لەسەر خوێند و لای گۆڕی باوکی بەخاکی سپارد.

کاتێك مەئمون هاتە ئەو شارە، چەند ڕۆژێك لای گۆڕی باوکی مایەوە. دەڵێن مەئمون عەلی کوڕی موسای ڕەزای بەترێی ژەهراوی، ژەهرخوارد کرد و من ئەمە بەدوور لەڕاستی دەزانم.

کاتێك عەلی کوڕی موسای ڕەزا مرد، مەئمون هەواڵی مەرگی ئەوی بۆ حەسەن کوڕی سەهل نووسی و پەژارەی خۆی لەمەرگی ئەو دەربڕی و لەم کارەساتە ئاگاداری کردەوە. ئەویش نامەیەکی بۆ خەڵکانی بەغداد و عەباسییەکان و موالییەکان نووسی و هەواڵی مەرگی ئەوی پێدان. لەنامەکەیدا نووسی ئەو کەسەی بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵی، ڕەخنەتان لەمن دەگرت، هەنووکە مردووە و داوای لێکردن ملکەچی فەرمانەکانی بن. خەڵکانی بەغداد بەناشیرینترین شێوە وەڵامیان دایەوە.

ڕۆژی لەدایك بوونی عەلی کوڕی موسای ڕەزا ساڵی سەد و چل و هەشتی کۆچی/ حەوتسەد و شەست و پێنجی زایینیە.

## گرفتار بوونی عیسا کوڕی محەممەد بەدەستی ئیبراهیم کوڕی مەهدی

لەکۆتایی شەوالی ئەم ساڵە/ ٢٨ ئاوریلی ٨١٩ زایینی، ئیبراهیم کوڕی مەهدی، عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالیدی زیندانی کرد. هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو عیسا لەلایەك نامەی بۆ حومەید و حەسەن کوڕی سەهل دەنووسی و و لەلایەکی دیکە ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی ئیبراهیم نیشان دەدا بەڵام هەرکات

ئیبراهیم داوای دەکرد بۆ جەنگی ئەحمەد[٢] بڕوات، بەبیانوی ئەوەی سوپاکەی داوای موچە دەکەن، خۆی لەم کارە بەدوور دەگرت. جاریکی دیکە دەیوت: رێگە بدات دەرفەتی گونجاو بەدەست بێت. کاتێك عیسا لەپێشڕەوی حومەید و حەسەن کوڕی سەهل دڵنیا بوو، بەڵێنی پێدان کەئیبراهیم کوڕی مەهدی لەدوایین هەینی شەوال تەسلیمی ئەوان دەکات.

هارون کوڕی محەممەد برای عیسا، ئیبراهیمی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. ئیبراهیم هاتە سەر پرد و بەخەڵکانی وت: داوام لەحوٚمەید کردووە نە ئەو خۆی لەکارەکانی من هەڵقورتێنێت نەمن لەکارەکانی ئەو. دواتر فەرمانیدا لەدەوروبەری پرد و دەروازەی شام خەندەك لێبدەن.

ئیبراهیم لەکار و کردەکانی عیسا ئاگاداری کردەوە. ئیبراهیم داوای لەعیسا کردبوو پێشنوێژی نوێژی هەینی بکات و عیسا رازی ببوو بەڵام کاتێك ئیبراهیم لەوتە و مەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە، کەسی بەدوادا نارد و بانگی کرد. عیسا بیانوی هێنایەوە و ئیبراهیم بەردەوام کەسی دەنارد. ئەو لەروسافە هاتە لای ئیبراهیم و کاتێك گەیشت، ئیبراهیم سەرکۆنە کردنی دەست پێکرد. عیسا بەردەوام داوای بەخشینی دەکرد و بەرپەرچی هەندێك لەوتەکانی دەدایەوە. ئیبراهیم فەرمانی ئەشکەنجە کردن و زیندانی کردنی ئەوی دەرکرد. ژمارەیەك لەخزم و سەرکردەکانی ئەویشی گرت و رەوانەی گرتووخانەی کردن. دەستەیەکیان خۆیان رزگار کرد. عەباس راوێژکاری عیسا یەکێك لەوکەسانەی بوو کەخۆی رزگار کرد.

خزمەکانی عیسا هاتوچۆیان دەستپێکرد و خەڵکیان دژی ئیبراهیم هاندەدا. سەرسەختترینی ئەوان عەباسی راوێژکاری عیسا بوو کەرێبەرایەتی ئەوانی گرتەدەست. ئەم تاقمە کۆبوونەوە و کارگوزارەکانی ئیبراهیمیان لەسەر پرد و کەرخ و شوێنەکانی دیکە دەرپەڕاند. خراپەکاران و سەرسەرییەکان دەرکەوتن. عەباس نامەی بۆ حومەید نووسی تا پێشڕەوی بکات بۆ ئەوەی بەغدادی تەسلیم بکەن.

---

[٢] لەمێژووی تەبەری بەحوٚمەید هاتووە و گومان دەکەم ئەمە راست بێت. (وەرگێر)

## چۆنیەتی لەسەر کار لابرانی ئیبراهیم کوڕی مەهدی

لەم ساڵەدا خەڵکانی بەغداد ئیبراهیم کوڕی مەهدییان لەسەر کار لابرد. پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بوو کە ئەو - وەك ئاماژەی پێدرا- عیسا کوڕی محەممەدی زیندانی کرد. کاتێك هاوەڵانی عیسا و لەناو ئەوان عەباس نامەیان بۆ حومەید نووسی و داوایان لێکرد ملی ڕێگە بگرێتەبەر، حومەید لەکەنار رووباری سەڕسەڕ دابەزی و ئوردووی لێدا.

عەباس و سوپاسالارەکانی بەغداد ڕۆشتنە لای. چاویان بەحومەید کەوت. ئەوان بەڵێنیان لەحومەید وەرگرت بەهەر سەربازێك پەنجا درهەم بدات. حومەید بەڵێنیدا ڕۆژی شەممە لەیاسرییە ئەم پارەیان پێ بدات بەو مەرجەی ئەوان لەهەینی پێشنیاری پەیوەست بوون بەسوپاکەی مەئمون و لەسەر کار لابردنی ئیبراهیم بەخەڵکان بکەن. ئەوانیش بەڵێنیاندا.

کاتێك ئیبراهیم لەمە ئاگادار بوویەوە، عیسا و کەسەکانی لەزیندان هێنایەدەر و داوای لێکرد بۆ شوێنەکەی خۆی بگەڕێتەوە و جڵەوی بارودۆخ بگرێتەدەست بەڵام عیسا رازی نەبوو.

لەڕۆژی هەینی، عەباس کوڕی محەممەد کوڕی باوکی ڕەجای فەقیهیان هێنا. ئەو نوێژی هەینی لەگەڵ خەڵکان خوێند و پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ مەئمونی بەخەڵکان کرد. حومەید هاتە یاسرییە و سەربازەکان بۆ وەرگرتنی پەنجا دینارەکە ریزیان بەست. حومەید بەهەرکام پەنجا دیناری بەخشی. سەربازەکان پێشنیاریان کرد دە درهەم لەم بڕە کەم بکاتەوە چوونکە ئەم بڕە کەپێشتر دەبوا عەلی کوڕی هوشام بەوانی بدات بەڵام پەیمانەکەی شکاند، بەشێوەیەکی خراپ لێکیان دەدایەوە و بەشومیان دەزانی. حومەید وتی: نا، بەڵکو دە درهەمی پێ زیاد دەکەم. بەم شێوەیە هەر سەربازە و شەست درهەمی وەرگرت.

کاتێك ئیبراهیم لەمە ئاگادار بوویەوە، عیسای بانگ کرد و داوای لێکرد جەنگ لەگەڵ حومەید دەست پێبکات. عیسا رازی بوو. ئیبراهیم، عیسای ئازاد کرد وبەڵێن و پەیمانی خوایی لێ ستاند. عیسا لەگەڵ سوپاکەی قسەی کرد و بەڵێنی پێدان ئەو بڕەیان پێ دەبەخشێت کەحومەید پێی بەخشین بەڵام سوپاکەی رازی نەبوون.

عیسا، هاورێ لەگەڵ فەرماندەکان لەبەشی رۆژهەلاتی سوپاکە گوزەریان کرد و مژدەیان بەسەربازەکاندا زیاتر لەشەست درهەمیان پێ ببەخشێت بەلام سەربازەکان جوێنیان بەخۆی و هاورێکانیدا و وتیان: عیسا تەسوویی [٣] لەگەڵ ئەوان گرفتار بوو. یەکێك لەفەرماندەکان ئەوی رزگار کرد و گەڕاندییەوە بۆ ماڵەکەی. کەسانی دیکە گەڕانەوە بۆ لای ئیبراهیم و ئاگاداریان کردەوە. ئیبراهیم ئەژنۆی خەمی لەباوەش گرت.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، موتەلیب کوڕی عەبدوالله کوڕی مالك خۆی لەئیبراهیم داشاردبوو. کاتێك حومەید هات، مەبەستی ئەوەی کرد پەیوەستی ببێت بەلام لەمەبەستەکەی ئاگادار بوونەوە و گرتیان و بردیانە لای ئیبراهیم. ئەو بۆ ماوەی سێ رۆژ زیندانی کرد و لەشەوی یەکەمی زی حەججە/ ٢٩ مەی ٨١٨ زایینی ئازادی کرد.

## خۆشاردنەوەی ئیبراهیم کوڕی مەهدی

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی مەهدی خۆی شاردەوە. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك هاوەڵان و سەرکردەکانی بینییان حومەید گەشتۆتە ئاشەکانی عەبدوالله کوڕی مالك، بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتنە لای حومەید و زۆربەیان پەیوەستی بوون و دەروازەکانی مەدائنیان بۆ کردەوە.

ئیبراهیم کاتێك ئەمەی بینی، هەموو کەسەکانی خۆی بۆجەنگ ڕەوانە کرد. ئەوان لەسەر پردی رووباری دیالە رووبەرووی سوپاکەی حومەید بوونەوە. هەر دوو سوپا دەستیان بۆ شمشێر برد. حومەید شکستیدان و سوپاکەی شوێن سوپاکەی ئیبراهیم کەوتن تا ئەوەی لەگەڵ ئەوان هاتنە ناو بەغداد. ئەم پێشهاتە لەکۆتاییەکانی رۆژی زیقەعدە/ ٢٧ ژوئەنی ٨١٨ زایینی روویدا.

لەجەژنی قوربان فەزل کوڕی رەبیع خۆی شاردەوە و دواتر بەرەو بارەگای حومەید بەرێکەوت. مناڵەکانی هاشم و سەرکردەکان یەك لەدوای یەك لای حومەید کۆبوونەوە. کاتێك ئیبراهیم ئەمەی بینی، ئەندێشەی لەبارودۆخی خۆی کرد.

---

[٣] تسو ١ کاژێر لە ٢٤ کاژێری شەوانە رۆژ

موتەلیب نامەی بۆ حومەید نووسی تا سنووری ژێر دەستی خۆی تەسلیم بکات. سەعید کوڕی ساجور و باوکی بەت و دەستەیەکی دیکە نامەیان بۆ عەلی کوڕی هوشام نووسی تا ئیبراهیمی بۆ بگرن. کاتێك ئیبراهیم لەمەبەستی ئەوان و کۆبوونەوەی کەسەکانی خۆی لەدەوری حومەید ئاگادار بوویەوە، لەشەوی چوارشەممە، حەڤدەی زی حەججە/ ٦ ژوئیەی زایینی خۆی شاردەوە.

موتەلیب کەسی بەدوای حومەید نارد و ئاگاداری کردەوە کەدەوری ماڵەکەی ئیبراهیمی گرتووە. حومەید دەستبەجێ لەئاشەکانی عەبدوالله بەرەو پردەکە بەرێکەوت. عەلی هوشامیش پێشڕەوی کرد و گەیشتە رووباری بەین. دواتر رووی کردە مزگەوتی کەوسەر و حومەید رووی کردە ماڵەکەی ئیبراهیم. بەدوای ئەودا گەڕان بەڵام هیچ نیشانێکیان لێ نەبینی.

ئیبراهیم بەهەمان شێوە بەشاراوەیی ژیانی دەبردەسەر تا ئەو رۆژەی کەمەئمون هات. تەنانەت دوای هاتنی ئەو لەحەشارگەکەی نەهاتەدەر.

ئیبراهیم یەك ساڵ و یانزە مانگ و دوانزە رۆژ لەسەر کار بوو. دوای ئەو، عەلی کوڕی هوشام فەرمانڕەوایی رۆژهەڵاتی بەغدادی دەکرد و حومەید فەرمانڕەوایی رۆژئاوا.

ئیبراهیم، سەهل کوڕی سەلامەی لەزیندان ئازاد کردبوو لەکاتێکدا خەڵکان گومانیان دەکرد ئەوی کوشتووە. ئەو رۆژی لەمزگەوتی روسافە بەسەر دەبرد و شەوان دەیانگەڕاندەوە بۆ زیندان تا ئەوەی ئیبراهیم بەیەکجاری لەزیندان ئازادی کرد و لەیەکەم شەوی زی حەججە/ ٢٩ مەی ٨١٨ زایینی رێگەی بۆ کردەوە. ئەویش رۆشت و خۆی شاردەوە و دوای هەڵاتنی ئیبراهیم جارێکی دیکە لەناو خەڵکان خۆی ئاشکرا کرد. حومەید ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و رێزی لێگرت و چاوی بەخێزان و ماڵ و منداڵەکەی رووناك کردەوە. کاتێك مەئمون هات، چەندین دیاری گرانبایی پێبەخشی.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەبیست و هەشتی زیحەججەی ئەم ساڵە/ ٢٥ ژوئەنی ٨١٨ زایینی، خۆر گیرا. لەم رۆژەدا زیاتر لەدوو لەسەر سێی خۆر لەبەر چاو ون بوو.

لەکۆتایی زیحەججەی ئەم ساڵە/ ٢٧ ژوئەنی ٨١٨ زایینی مەئمون هاتە

هەمەدان.

سلێمان کوڕی عەبدوالله کوڕی سلێمان کوڕی عەلی ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا لەخوراسان چەندین ئەرهەژێن پانتایی ئەم دیارەی لەراندەوە و حەفتا رۆژ بەردەوام بوو. زۆربەی ئەم ئەرد هەژێنانە شارەکانی بەلخ، جوزجان، فارياب، تاڵەقان، ماوەرا ئەلنەهری گرتەوە و هەموو شار و ماڵەکانی وێران کرد و ژمارەیەکی زۆری کوشت.

لەم ساڵەدا مالیخۆلیا یەخەی حەسەن کوڕی سەهلی گرت و ئاوزی لێ سەندەوە و بەناچاری لەژورێکدا زیندانییان کرد و دەرگایان بەروودا بەست. سەرکردەکان ئەم بەسەرهاتەیان بۆ مەئمون نووسی و ئەویش دینار کوڕی عەبدوالڵەی کردە فەرماندەی سوپاکەی و پەیکی ڕەوانە کرد کەخۆی بەم نزیکانە دەگات.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەخەڵکانی ئاندۆلۆس بەناوی وەلەد ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو لەبەرابەر پاشای ئاندۆلۆس شۆڕشی کرد و پاشا، سوپايەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و لەباجەی کەدەستی بەسەردا گرتبوو، گەمارۆیان خستەسەر و دەرئەنجام گرتیان و زیندانییان کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی جەعفەری سادق لەگورگان کۆچی دوایی کرد. مەئمون نوێژی لەسەر خوێند. خەڵکانی حیجاز وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو.

هەروەها لەم ساڵەدا خوزەیمە کوڕی خازمی تەمیمی لەمانگی شەعبان/ ٣١ ژانویەی زایینی مرد. ئەو یەکێکە لەسەرکردە بەناوبانگەکان. ئەو هەواڵانەی لەو دەیگێڕنەوە نیشانەی پێگەی بەرزی ئەوە.

یەحیا کوڕی ئادەم کوڕی سلێمان و باوکی ئەحمەدی زوبەیری و محەممەد کوڕی بەشیری عەبدی فەقیهی کوفە و نەزر کوڕی شومەیلی لوغەوی حەدیس بێژی بڕواپێکراو، هەموويان کۆچی دواييان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چواری کۆچی ( ٨١٩ زایینی )

### هاتنی مەئمون بۆ بەغداد

لەم ساڵەدا مەئمون هاتە بەغداد و ئاژاوەکان دامرکانەوە. ئەو بۆ ماوەی یەك مانگ لەگورگان مایەوە و دەگەیشتە هەر مەنزڵێك، یەك یا دوو سێ ڕۆژ خێوەتی هەڵدەدا. هەشت ڕۆژ لەنەهرەوان مایەوە. بنەماڵە، کەس و کار، فەرماندەکان، گەورەکان و سەرکردەکان دەهاتنە بارەگاکەی و سڵاویان بۆ دەنارد.

ئەو نامەیەکی بۆ تاهیر لەڕەققە نووسی و داوای لێکرد لەنەهرەوان پەیوەستی ببێت. تاهیر هاتە نەهرەوان. مەئمون لەنیوەی سەفەر/ ١٨ نۆڤەمبەری ٨١٩ زایینی هاتە بەغداد. جل وبەرگی خۆی و هاوڕێکانی سەوز بوو. کاتێك مەئمون گەیشتە بەغداد، لەروسافە دابەزی و دواتر لەکۆشکەکەی خۆی لەکەنار بەستێنی دیجلە نیشتەجێ بوو. فەرمانی بەسەرکردەکانی سوپادا لەئوردووگاکەی خۆیان بمێننەوە.

خەڵکان بەجل و بەرگی سەوزەوە دەهاتنە بارەگاکەی و ئەگەر کەسێکیان بەجل و بەرگی ڕەشەوە دەبینی، جلەکانیان دەدڕاند. هەشت ڕۆژ بەم شێوەیە تێپەڕی تا ئەوەی سەرکردەکانی مناڵەکانی عەباس و سوپا سالارەکانی خوراسان ( سەبارەت بەجل و بەرگی سەوز و ڕەش) لەگەڵ مەئمون دووان.، دەگێڕنەوە کەمەئمون فەرمانی بەتاهیر کوڕی حسەین داوە تا نیازەکانی خۆی باس بکات. یەکەم داواکاری تاهیر ئەوە بوو مەئمون جل و بەرگی ڕەش لەبەر بکاتەوە (ڕەش بکاتە دروشم و نیشانی خۆی) مەئمون ڕازی بوو. لەبەردەم میوانەکان ئامادە و جل و بەرگی ڕەشیان هینا و لەبەری کرد. جل و بەرگی ڕەشی کردە بەر تاهیر و بەهەموو فەرماندەکان جل و بەرگی ڕەشی بەخشی. خەڵکان هەمووان ڕەشیان پۆشی. ئەم پێشهاتە لەبیست و سێی مانگی سەفەر/ ٢٦ نۆڤەمبەری ٨١٩ زایینی ڕوویدا.

ڕۆژێك ئەحمەد کوڕی باوکی خالیدی ئەحوەل بەمەئمونی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، بیر لەوە دەکەمەوە چۆن ڕێگەی بەغدادمان گرتۆتەبەر لەکاتێکدا زیاتر لەپەنجا هەزار درهەممان پێ نییە لەگەڵ ئەو ئاژاوەی خەڵکانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە، چی ڕوودەدات ئەگەر کەسێك سەر بەرز بکاتەوە یا ئاژاوەیەك ڕووبدات؟ مەئمون وتی: ڕاست دەکەیت ئەی ئەحمەد بەڵام بزانە خەڵکانی ئەم شارە بەسێ

دەستە پێکهاتوون، یا ستەمکاران یا ستەم لێکراو و دەستەیەکیان نەستەمکارن نە ستەملێکراو. ستەمکار تەنیا چاوەڕوانی بەخشینی ئێمە دەکات و ستەم لێکراو چاوەڕوانە لەسێبەری ئێمەدا مافەکانی وەربگرێتەوە و ئەو کەسەی نەستەمکارە و نە ستەملیکراو، لەماڵەکەی خۆی نایێتەدەر. بەو شێوە بوو کەمەئمون پێشبینی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەئمون فەرمانیدا بەشی خەڵکانی دەوروبەری عێراق دوو لەسەر پێنج بێت. پێشتر لەسەر بنەمای نیوە کاریان دەکرد ( بەشی خاوەن زەوی لەدانەوێڵە بەمشێوە بوو) مەئمون پێوانەیەکی نوێی هێنایە کایەوە کەبەرابەر بوو لەگەڵ دە پێوانەی هارونی.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی موعاز جەنگی دژی بابەکی خورەمدین بەرپا کرد بەڵام کەسیان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا.

لەم ساڵەدا مەئمون باوکی عیسا، براکەی خۆی کردە فەرمانڕەوای کوفە و ساڵح، براکەیتری کردە فەرمانڕەوای بەسرە. عوبەیداللە کوڕی حەسەن کوڕی عوبەیداللە کوڕی عەباس کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالبی کردە سەرپەرەستی حەرەمەکان. لەم ساڵەدا عوبەیداللە ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەد سەیید کوڕی ئەنسی ئەزدی لەموسڵەوە بۆ سەردانی مەئمون هات و محەممەد کوڕی ساڵح لای مەئمون سکاڵای دژی سەیید بەرز کردەوە. دەڵێن: سەیید کوڕی ئەنس براکان و بنەماڵەی محەممەد کوڕی حەسەنی کوشتار کردبوو. مەئمون سەیید کوڕی ئەنسی بانگ کرد. کاتێك سەیید هاتە بارەگاکەی، مەئمون پێی وت: تۆ سەییدیت؟ کوڕی ئەنس وتی: تۆ خۆت سەییدیت ( بەڕێزیت) ئەی سەروەری باوەڕداران، من زادەی ئەنسم. مەئمون ئەم وتەی پەسەند کرد، دواتر پرسی: ئایا تۆ براکانی ئەوت کوشتووە؟ کوڕی ئەنس وتی: بەڵێ، ئەگەر خۆیشی لەگەڵ ئەوان دەبوو، خوێنی ئەویشم دەڕشت چوونکە ئەوان پێگەی پیاوێکیان لەخەواریج بەرز کردەوە و هێنایانە سەر مینبەر و بانگەوازی بەیعەت کردن بۆ

تۆیان بەدرۆ لەقەڵەمدا. مەئمون لێی خۆش بوو و فەرمانڕەوایی موسڵی پێ بەخشی. دادیاری موسڵ لەو کاتەدا حەسەن کوڕی موسای ئەشیب بوو.

لەم ساڵەدا ئیمام محەممەد کوڕی ئیدریسی شافعی، کۆچی دوایی کرد. ساڵی لەدایك بوونی سەد و پەنجای کۆچی/ ٧٦٧ زاییینییە. شافیعی پێشەوای مەزهەبی شافیعی و دووەمین ئیمامی گەورەی سونییەکانە کەخۆی شیعە و شوێنکەوتەی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو و بەتاوانی شوێنکەوتنی بنەماڵەی عەلی، لەلایەن مەنسورەوە چەندین کەس بۆ گرتنی راسپێردرا.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زیادی لۆلۆئی فەقیە یەکێك لەهاوەڵانی باوکی حەنیفە و باوکی داود سلێمان کوڕی داودی تەیالسی نووسەری کتێبی موسنەد (مسند) کە لەساڵی سەد و سی و سێی کۆچی/ ٧٥٠ زاییینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا کۆچی دوایی کرد. هوشام کوڕی محەممەد سائیبی کەلبی رەچەڵەك ناس لەم ساڵەدا مرد. دەستەیەك دەڵێن کەلبی لەساڵی دووسەد و شەشی کۆچی/ ٨٢١ زاییینی کۆچی دووایی کردووە.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عوبەید کوڕی باوکی ئومەییە ناسراو بەتەنافسی مرد. دەستەیەك دەڵێن ئەو لەساڵی دووسەد و پێنجی کۆچی/ هەشسەد و نۆزدەی زاییینی مردووە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پێنجی کۆچی (٨٢٠ زایینی)

## فەرمانڕەوای تاهیر لەخوراسان

لەم ساڵەدا مەئمون، تاهیری کردە فەرمانڕەوای ڕۆژهەڵات و بەمشێوەیە لەمدینە السلام (بەغداد) تا کۆتایی ڕۆژهەڵات (کەسنووری فەرمانڕەوای عەباسییەکان بوو) کەوتە ژێر دەسەلآتی تاهیر. پێشتر تاهیر فەرمانداەی پاسەوانەکانی دوو بەشی بەغداد و سوادی عێراق بوو.

چۆنیەتی ئەم فەرمانڕەوایەتییە بەمشێوەیە: ڕۆژێك تاهیر هاتە بارەگای مەئمون و ئەو سەرقاڵی خواردنەوە بوو. حسەینی خزمەتکار پیاڵەی بۆ پڕ دەکرد. کاتێك تاهیر ڕۆشتە لای، یەك دوو پیاڵەی دەرخواردا و فەرمانی مانەوەی پێدا. تاهیر وتی: شیاو نییە بۆ فەرماندەی پاسەوانەکان لای سەروەری خۆی دانیشێت. مەئمون وتی: لەشوێنی کۆبوونەوەی گشتی بەو شێوەیە بەڵام لێرە تەنیا من و تۆی لێین. ئەمەی وت و چاوی پڕ بوو لەفرمێسك. تاهیر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ دەگرییت، هیوادارم هیچ کات فەرمێسك لەچاوی تۆدا نەبینم. سوێند بەخوا هەموو سەرزەمینە ئیسلامیەکان ملکەچی فەرمانەکانی تۆن و بەندەکانی خوا بەرابەر تۆ ریسوا و خۆشەویستی تۆیان لەدڵدایە. مەئمون وتی: بۆ ئەوە دەگریم کەئەگەر بیڵێم ریسوا دەبم و ئەگەر باسی نەکەم لەناخەوە دەمڕزێنێت. کەس بێ خەم نییە.

تاهیر ڕۆشت و هارون کوڕی جیغونەی بانگ کرد و پێی وت:خەڵکانی خوراسان پشتی یەك دەگرن، سێسەد هەزار درهەم هەڵبگرە، دووسەد هەزاری بەحسەینی خزمەتکار بدە و سەد هەزاری بە محەممەد کوڕی هارون، داوا لەحسەینی خزمەتکار بکە لەمەئمون بپرسێت بۆ لەکاتی هاتنی تاهیر گریا. ئەو رازی بوو مەبەستەکەی بێنێتەدی. کاتێك مەئمون سەرقاڵی خواردن بوو، فەرمانی بەحسەیندا پیاڵەی بۆ پڕ بکات. حسەین وتی: سوێند بەخوا پیاڵە پڕ ناکەم تا ئەو کاتەی نەڵێیت بۆ ئەو کاتەی تاهیر هاتە لای تۆ، دەستت بەگریان کرد؟ مەئمون وتی: چی بوو کەوتیتە بیری ئەم ڕووداوە؟ حسەین وتی: لەم ڕووداوە خەمبارم. مەئمون وتی: ئەگەر ئەوەی باسی دەکەم، باسی بکەیت، سەر لەجەستەت جیا دەکەمەوە. حسەین وتی: ئەی

سەروەری باوەرداران، کەی نهێنییەکانی تۆم ئاشکرا کردووە؟ مەئمون وتی: محەممەدی برام و هەژاری ئەوم بیرکەوتەوە و نەمتوانی رێگە لەفرمێسکی خۆم بگرم و بەگریان خەمی خۆمم سوك کرد. بێ گومان لەمن بەتاهیر ئەوە دەگات کەپەسەندی ناکات.

حسەینی خزمەتکار تاهیری لەم گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە. تاهیر ڕۆشتە لای ئەحمەد کوڕی باوکی خالید و وتی: وەسف کردنی من لەتۆ هەرزان نییە و چاکەکاری تۆ لەگەڵ من بێ وەلأم نابێت، من لەچاوی مەئمون دوورخەرەوە. ئەحمەد وتی: ئەو کارە دەکەم.

ئەو ڕۆشتە لای مەئمون و پێی وت: دوێ شەو چاوم نەخستە سەر یەك. مەئمون وتی: بۆ؟ ئەحمەد وتی: چوونکە تۆ غەسانت کردۆتە فەرمانڕەوای خوراسان، ژمارەی شوێنکەوتەو کەسەکانی کەمە، دەترسم کەسێك ئالأی شۆڕش بەرز بکاتەوە و لەناوی ببات. مەئمون وتی: منیش بیرم لەم بابەتە کردۆتەوە. بۆچونی تۆ چییە؟ ئەحمەد وتی: تاهیر کوڕی حسەین وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە ڕەوانە بکە. مەئمون وتی: هاوار لەتۆ، سوێند بەخوا ئەو لەسەر کار لام دەبات. ئەحمەد وتی: من دەستەبەری ئەوم. مەئمون وتی: ڕەوانەی بکە. ئەحمەد دەستبەجێ تاهیری بانگ کرد و ئالأی فەرمانداری بۆ هەڵکرد. تاهیر هەمان ڕۆژ بەرێکەوت و لەدەرەوەی شار یەك مانگ مایەوە تا دە هەزار درهەم کەدەبوا بەفەرمانڕەوای خوراسان بدرێت، پێی درا. ئەو لەبیست و نۆی زیقەعدە/ ٦ مەی ٨٢٠ زاییني لەبەغدادەوە بەرێکەوت.

دەڵێن: چۆنیەتی فەرمانڕەوایی ئەو بەمشێوە بوو: عەبدولرەحمانی مەتوعی دەستەیەکی فراوانی لەنەیشابور کۆکردەوە تابێ هیچ مۆڵەتێك لەلایەن فەرمانڕەوای خوراسان جەنگ لەگەڵ خەواریج هەڵگیرسێنێت. کەسانیتر ترسا نەکا لەپشتی پەردە عەبدولرەحمان بیری لەفرت وفێڵ کردبێتەوە. غەسان کوڕی عوباد بەنوێنەرایەتی حەسەن کوڕی سەهل کەکوڕە مامی بوو، فەرمانڕەوایی خوراسانی دەکرد. کاتێك تاهیر فەرمانرەوایی خوراسانی گرتەدەست، لەنێوان ئەو و حەسەن کوڕی سەهل ناسازگاری و دژایەتی هاتە ئاراوە. چۆنیەتییەکەی ئەوە بوو

کەحەسەن کوڕی سەهل داوای لەتاهیر کرد دژی نەسر کوڕی شەبەس بجەنگێت. تاهیر وتی: من دژی خەلیفەیەك جەنگاوم و خەلافەتم بۆ خەلیفەیەکی دیکە ئامادە کرد بەلاّم هەنووکە فەرمانی ئەم کارە کەم بەهایەم پێ دەدرێت. شیاوە یەکێك لەفەرماندەکانی من بۆ ئەم جەنگە بڕوات. ئەمە بووە هۆی ناسازگاری نێوانیان.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی تاهیر کوڕی حسەین لەرەققەوە ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر. باوکی ئەوی وەك جێگری خۆی لەرەققە دیاریکردبوو. فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ نەسر کوڕی شەبەس هەڵگیرسێنێت. کاتێك ئەو هاتە بەغداد، مەئمون ئەوی لەجێگەی باوکی کردە فەرماندەی پاسەوانەکان.

لەم ساڵەدا مەئمون یەحیا کوڕی موعازی وەك فەرمانڕەوای جەزیرە و عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالیدی وەك فەرمانڕەوایی ئەرمەنستان و ئازەربایەجان دیاریکرد و فەرمانی پێدا شەڕ لەگەڵ بابەك دەست پێبکاتەوە.

لەم ساڵەدا سەری کوڕی حەکەم فەرمانداری میسر، مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا داود کوڕی یەزید فەرمانداری سند مرد و مەئمون بەشیر کوڕی داودی لەجێگەی ئەو دانیشاند بەو مەرجەی ساڵانە هەزار هەزار درهەم بۆ بارەگاکەی ڕەوانە بکات.

لەمساڵەدا مەئمون، عیسا کوڕی یەزیدی جەلوزی بۆ جەنگ لەگەڵ دەستەی زەت (خەڵکانی سند) ڕەوانە کرد. عوبەیدالله کوڕی حەسەن فەرمانداری مەککە و مەدینە ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ئاوی دیجلە زیادی کرد بەشێوەیەك کەژمارەیەکی زۆر لەماڵەکانی بەغداد کەوتنە ژێر ئاو.

هەروەها لەم ساڵەدا یەزید کوڕی هارونی واستی مرد. ساڵی لەدایك بوونی سەد و بیست و نۆی کۆچی/ ٧٤٦ و زایینیە. حەجاج کوڕی محەممەدی ئەعوەری فەقیە، شەبابە کوڕی سواری فەزاریی فەقیە و عەبدوالله کوڕی نافیعی سائیغ و موحازیر کوڕی موەزەع و باوکی یەحیا ئیبراهیم کوڕی موسای زیاتی موسڵی کە لەهوشام کوڕی عوروە و کەسانی دیکە حەدیسی دەگێڕایەوە، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەشی کۆچی ( ٨٢١ زایینی )

## فەرمانڕەوایی عەبدواللە کوڕی تاهیر لەڕەققە

لەم ساڵەدا مەئموون، فەرمانڕەوایی ڕەققە تا میسری بەعەبدواللە کوڕی تاهیر بەخشی و فەرمانی جەنگ دژی نەسر کوڕی شەبەسی پێدا.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو یەحیا کوڕی موعاز کارگوزاری مەئموون لەجەزیرە لەم ساڵەدا مرد و کوڕەکەی ئەحمەدی کردە جێگری خۆی. دواتر مەئموون، عەبدواللەی لەجێگەی ئەو دانیشاند. کاتێك مەبەستی ئەوەی کرد وەك فەرمانڕەوا دیاری بکات، بانگی کرد و پێی وت: ئەی عەبدواللە! زیاتر لەیەك مانگە لەخواوەند دەپارێمەوە و هیوادارم دۆعاکەم بێنێتەدی. بینیومە پیاوێك وەسفی کوڕەکەی خۆی دەکات تا وەسفی خۆی کردبێت، بەڵام تۆ زیاتری لەوەی باوکت وەسفی کردبووی. هەنووکە یەحیا مردووە و کوڕە نەشیاوەکەی لەجێگەی خۆی داناوە. بەباشم زانی فەرمانڕەوای میسر بەتۆ بسپێرم بەهەمان شێوە کەبۆ جەنگ دژی نەسر کوڕی شەبەس بەشیاوت دەزانم.

عەبدواللە وتی: بەسەرچاو، منیش هیوادارم خواوەند چاکە و خۆشی بەسەروەری باوەڕداران ببەخشێت. مەئموون ئاڵای فەرمانڕەوایی بۆ بەست. هەروەها دەڵێن: فەرمانڕەوایی ئەو لەساڵی ٢٠٥/٨٢٠ زایینی بووە بەهەمان شێوە کەدەستەیەك فەرمانڕەوایی ئەو بۆ ساڵی ٢٠٧/٨٢٢ زایینی دەگێڕنەوە.

کاتێك عەبدواللە بەرێکەوت، کوڕە مامەکەی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی حسەین کوڕی مەسعەب وەك فەرماندەی پاسەوانەکان لەجێگەی خۆی دانیشاند. کاتێك مەئموون، عەبدواللەی بۆ فەرمانڕەوایەتی ڕاسپارد، تاهیری باوکی نامەیەکی بۆ نووسی و ڕێگە و شێوازەکانی سیاسەتی بیرخستەوە کەهەر فەرمانڕەوایەك پێویستی پێیەتی. من پەسەندترین بەشی ئەم نامەیە لێرەدا باس دەکەم کە لەخۆگری ڕێ و ڕەسمەکانی فەرمانڕەوایەتی و سرشتە جوانەکانە چوونکە هەموو فەرمانڕەوایەك پێویستی پێیەتی:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

دوای سپاس و وەسفی پەروەردگار، لەسەر تۆ بێت ( ئەی کوڕی خۆم) لەخواوەندی تاقانە و بیٚ شەریك بترسیت و پێگەی خواوەندی ئەو لەبەرچاو بگریت و لەتوڕەیی ئەو خۆت و هاولآتیانت بپارێزیت.

ئەو تەندروستییەی خواوەند بەتۆی بەخشیوە، بەبیرکردنەوەی رۆژی هەستانەوە و ئەو رێگەی بەناچاری بۆ ئەوی دەڕۆیت و بۆ ئەوێت دەبەن و لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دەکەن، پەیوەست بکە و بەرادەیەك هەوڵی بۆ بدە کەخواوەند لەرۆژی هەستانەوە لەئەشکەنجە و سزاکان رزگارت بکات، چوونکە خواوەند چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە و سەرپەرشتی بەندەکانی خۆی بەتۆ سپاردووە و دادخوازی و پاسەوانی کردن و پاراستنی ئەوانی کردۆتە ئەرکی سەرشانی تۆ ، پێویستە خوێنیان بپارێزیت و رێگەکانیان بۆ ئەمان و ژیانیان بۆ ئاسوودە بکەیت. سەبارەت بەم ئەرکانە، لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دەکریت و لەمبارەوە، سزای کارەکانی رابردووت و داهاتوت دەدرێتەوە. ئەندێشە و ئاوز و هزری خۆت بۆ ئەم رێگەیە بەکار ببە و هیچ شتێك تۆ لەرێگەی راست بیٚ ئاگا و دوور نەکاتەوە چوونکە نهێنی کار و هەوڵدانەکەی تۆ بۆ رەزامەندی خواوەند ئەمەیە و بەس.

یەکەم کار کەدەبێت پێوەی سەرقاڵ بیت و کارەکانی خۆتی پێوە پەیوەست بکەیت، رێز گرتن و بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژە، دەبێت لەگەڵ خەڵکانی دیارەکەت نوێژی جەماعەت بەرپا بکەیت و لەکاتی نوێژ، بۆ رێز گرتن لەسونەتەکان بەباشترین شێوە دەستنوێژ دەگریت، بەبیرهێنانەوەی ناوی خواوەند دەست پێدەکەیت و رکوع و سجود و شایەتومان دەهێنیتە سەرزومان، دەبێت لەم کارەت نییەتی پاکت لەدڵدا بێت، ئەو دەستەی هاورێی تۆ و لەژێر فەرمانی تۆدان، بۆ نوێژ هان بدە و ناچاریان بکە چوونکە خواوەند دەفەرمێت: نوێژ رێگە لەکاری خراپ و قێزەونەکان دەگرێت. دوای ئەمە پێبەندی سونەتی پێغەمبەر(د.خ) بە و بۆئەنجامدانی سوونەتەکان پێدار و رێگەی چاکەکاران بگرەبەر.

هەرکات کێشەیەك هاتە پێش، بۆ چارەسەر کردنی ئەم کارە ترسی خواوەند و پێبەند بوون بەفەرموودەکانی لەفەرماندان بەچاکە و رێگرتن لەخراپە تا حەلاڵ و

حەرام لەبەرچاو بگرە، دواتر سەبارەت بەم کێشە، ئەو مافەی خواوەند بەتۆی سپاردووە، بەجێبێنە. لەدادپەروەری لەگەڵ کەسە نزیك و دوورەکانی خۆت بێ ئاگا مەبە.

شارەزایانی دین و بڕواداران و قورئان خوێنەکان لەخۆت نزیك بکەرەوە چوونکە باشترینی کەسەکان قووڵبوونەوە لەدین و تەخت کردنی ڕێگەکەی و ناسینی ئەو کاروبارانەیە کەمرۆڤ لەخواوەند نزیك دەکاتەوە و ئەمە ئەو شتەیە ڕێنیشاندەری هەموو چاکەکان پێشنیاری پێدەکات و لەهەموو خراپەکان دوورت دەخاتەوە. بەئاسانکاری پەروەدگار، ناسینی مرۆڤەکان لەخواوەند فراوان دەبێت تا ئەو جێگەی بەگەورە لەقەڵەمی دەدات و پێگە بەرزەکانی ڕۆژی هەستانەوەی بیر دەکەوێتەوە، بەشێوەیەك دەرکەوتنی ئەم تایبەتمەندییە لەناو خەڵکان پێگەت بەرز دەکاتەوە و فەرمانڕەوایەتییەکەت دەپارێزێت و دەبێتە هۆی نزیك بوونەوەی ئەوان لەتۆ.

لەهەموو کارەکان میانڕەو بە چوونکە هیچ شتێك سوودێکی ئاشکراتر لەوەی نییە و پێشی ناکەوێت. میانڕەوی هۆکارێکە بۆ ڕزگاریی و ڕزگاری نیشانەی بەختەوەرییە. میانڕەوی کۆڵەکەی دین و سونەتە ڕێنیشاندەرەکانە، کەواتە لەژیانی خۆتا هەڵیبژێرە و بۆ بەدەست هێنانی پاداشەکانی ڕۆژی پەسلان و چاکەکاری و خێرخوازی، کەمتەرخەمی مەکە چوونکە زیادەخوازی هیچ سنورێکی نییە ئەگەر چاکە و هەوڵدان بەبەدەست هێنانی لەدڵەوە بۆ ڕەزامەندی خواوەند بێت و لەگەڵ هاوڕێیانی پەروەدگار لەماڵەکەی ئەودا هاودەم بیت.

بزنە میانڕەوی لەدنیا سەرچاوەی بەرێز و دوور بوونە لەگوناحەکان و ئەم باشترین قەڵا بۆ تۆ و کەسەکانی تۆیە. میانڕەوبە و چارەسەرەکان لەم ڕێگەوە بدۆزەرەوە چوونکە کارەکان دەگەنە ئەنجام و هێزت زیاد دەکات و بارودۆخی کەسە نزیکەکان و خزمەکانت سەقامگیر دەبێت. بەردەوام بەخواوەند خۆش بین بە تا هاووڵاتییەکانت ڕێگەی ڕاستی بگرنەبەر. لەهەموو کارەکان پشت بەخوا ببەستە تا نیعمەتەکان بۆ تۆ زیاد بکات. گومانی خراپ لەهیی کەسێك مەکە کە بۆ کارێکی رایدەسپێریت چوونکە بەدگومانی لەبێ گوناحەکان، گوناحە. دەبێت هەمیشە

لەهاوەڵانی خۆت گەشبین بیت. بەدگومانی لەوان لەخۆت دوور بخەرەوە چوونکە بەگرتنەبەری ئەم ڕێگەیە دەتوانیت بۆ کارە چاکەکان ناچاریان بکەیت. ئاگاداربە شەیتان کەدوژمنی خوایە، درزە نەکاتە ناو کارەکانی تۆ، ئەو هەنووکە بەسستی تۆ بەسەندە دەکات و خەمی سەرچاوە گرتوو لەبەد گومانی چەند بەرابەر لەسەر شانی تۆ قورس دەکات و بەختەوەری ژیانت بۆ بەدبەختی دەگۆڕێت.

دڵنیابە لەگەشبینی هێز و ئاسایشت دەست دەکەوێت و لەبەر رووناکی ئەوە دەتوانی کاروبارەکانت ئەنجام بدەیت کەئارەزووی ئەنجامدانیانت هەیە. خۆشەویستی خەڵکان بەدەست دەهێنیت و لەهەموو کارەکان بۆ ڕێگەی راستیان دەبەیت. ئاگاداربە گەشبینی لەبەرابەر هاوەڵان و هاورێیان تۆ لەلێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە لەکارەکانی خۆت دوور نەکاتەوە. دەبێت چاودێری کاری هاورێیان بکەیت و بۆ وەرگرتین مافی هاوڵاتیان وشیار بیت و لەوەی دەبێتە خۆی راستی و سەقامگیر کردنی بارودۆخ، چاو نەپۆشیت. دابین کردنی نیازەکانی ئەوان و خەرجییەکانیان دەبێت لای تۆ بەهادار لەکارەکانی دیکە بێت. ئەم بۆ دین بەهێزتر و بۆ سوونەت ژیان بەخشترە.

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە بەبڕشت بە و خۆت هاوشێوەی کەسێك لەلارێکان بپارێزە کەدەزانێت لەوەی دەیکات، پرسیاری لێدەکرێت و پاداشتی چاکە و سزای خراپەکەی وەردەگرێتەوە. خواوەند، ئابڕو و قەڵایەکی بەهێزی بەبەرێز و باوەڕدار بەخشیوە و هەرکەس شوێنکەوتەی دین بیت، پێگەی بەرزدەکاتەوە. کەواتە ژێر دەستەکانی خۆت بۆ ڕێگەی دین ڕێنوێنی بکە.

لەناو خراپەکاران بەئەندازەی جێگا و مافی هەرکام، سنوورەکانی خواوەند بپارێزە و پشتگوێی مەخە و سزای ئەوەی دەبێت بدرێت، بۆ سبەی دوا مەخە چوونکە ئەم کەمتەرخەمییە گومانی چاکەی تۆ سەبارەت بەخۆت بەفیڕۆ دەدات. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە گرنگی بەسونەتە چاکەکان بدە و لەدیاردە تازەکان و گومان خۆت بەدوور بگرە بۆ ئەوەی دینەکەت بەراستی بمێنێتەوە و جوامێریت لەجێگەی خۆی بێت.

هەرکاتێك پەیمانێکت بەست، بەدیبێنە و هەرکات بەڵێنی کارێکی چاکەتدا،

بەئەنجامی بگەیێنە. بەچاکە رازی بە و پاداشتی بدە. لەئیرادی هاولاتیانت چاوبپۆشە و زمان لەقسەی درۆ وبێهۆ بپارێزە و رقی کەسانی لەم شێوە لەدڵ بگرە. سزای دوو زمانەکان بدە چوونکە یەکەم فێرۆیی لەکارەکانی ئەم دنیا و ئەو دنیات نزیك کردنەوەی درۆزنەکان و بوێری ئەوان بۆ درۆ کردنەوە چوونکە درۆ سەرەتای هەر گوناحێك و دوو زمانی کۆتاییەتی. دووزمان، تەندروست نابێت و هاورێکەی لەتەندروستی بەدوور دەبێت و ئەوکەسەی خوازیاری دانیشتن لەگەڵ ئەم کەسانە بێت، بارودۆخی سەقامگیر نابێت.

فەرمانبەرانی راستی و دروستیت خۆش بوێت. هاوکاری نەجیب زادەکان بۆ ئەنجامدانی کارە چاکەکان بکە و هاوریٌ ناتەوانان بە، رێز لەخزمان بگرە و لەئەنجامدانی ئەم کارانە پاداشی خواییت لەبەرچاو بێت. لەخراپەکاری و ستەم خۆت بەدوور بگرە و ئەندێشە لەو دوانە بەدوور بگرە و نارەزامەندی خۆت لەوان بۆ هاولاتیانت ئاشکرا بکە وبەرێوەبردنی کاروباری ئەوان تێکەڵ بەدادپەروەی بکە. لەنێوان ئەوان بەپێی ماف و راستی هەڵس و کەوت بکە چوونکە ئەمە رێگەی رزگاریت نیشان دەدات.

تەماحی خۆت لەبیر بکە، دەبێت چاکەکاری و لەخواترسی و دادپەروەری و رێکخستنی کاروباری شارۆمەندان و ئاوەدان کردنەوەی شارەکان و لێپرسینەوە و پاراستنی خوێن و سامانی ئەوان و دڵنەوایی کردنیان، گەنجینەیەك بێت کەپاشەکەوتی دەکەیت بزانە ئەگەر پارەیەك لەگەنجینەیەك پاشەکەوت بکرێت، زیاد ناکات و ئەگەر بۆ ئاسوودەی هاولاتیانت خەرجی بکەیت، زیاد دەبێت و پاك دەبێت و دەروێت و کاری خەڵکان بەگشتی راست دەبێت و فەرمانرەوایی تۆ لەبەر رووناکی ئەوە، دەرازێتەوە و رۆژگار بەخۆشی دەرواتەسەر و پێگەیەکی بەرزت پێ دەبرێت. دەبێت گەنجی خەزێنەکانی تۆ لەرێگەی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج بکرێت، مافی باوەرداران بێ کەم و کوری بدە، بەشی خەڵکان بۆخۆیان بگەرێنەرەوە و ئەوەی دەبێتە هۆکاری ئاسوودەی ژیانی ئەوان، بەدیبێنە چوونکە ئەگەر ئەو کارە بکەیت، نیعمەتەکانی تۆ پایەدار و شیاوی فراوانی نیعمەتەکان لەلایەن پەروەردگارەوە دەبیت و بۆ کۆکردنەوەی باج و کۆکردنەوەی سامان لەخەڵکان

بەتواناتر دەبیت و خەڵکان بەهۆی دادپەروەری و چاکەکاری تۆ، گوێرایەڵی فەرمانەکانت دەبن و ئەوەی ئەنجامی بدەیت، بەشادمانییەوە پێی رازی دەبن.

سەبارەت بەوە بۆم نووسیوی، هەوڵ بدە چوونکە لەم سامانە، تەنیا ئەوەی لەرێگەی راستی خەرج کرابێت، دەمێنێتەوە. رێز لەسپاسی سپاسکەران بگرە و بۆ ئەم کارە پاداشتیان پێ ببەخشە. ئاگاداربە دنیا و روخساری هەڵخەڵەتێنەری ئەم دنیا، نەبنە هۆی لەبیر کردنی ئەو دنیا و بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانت ناتەوانت بکەن چوونکە ناتەوانی کەمتەرخەمی بەدواوە دێت و کەمتەرخەمی، وێرانی. دەبێت کارەکانت لەرێگەی خوادا بێت وچاوەڕوانی پاداشت بکەیت. خواوەند نیعمەتەکانی بەتەواوی بەتۆ بەخشیوە، کەواتە سپاسی بکە و پشتی پێ ببەستە تا چاکەکاری تۆ فراوان بکات، خواوەندی کردگار بەئەندازەی سپاسی سپاسکەران و کردەوەی چاکەکاران، پاداشتیان پێ دەبەخشێت.

دین بەکەم بەها مەزانە و دڵ بەچاوچنۆك مەبەستە و بەزەییت بەخراپەکاردا نەیێتەوە، رێز لەناسپاسەکان مەگرە و زمانت بۆ دوژمن ئامادە بێت، بەڵێ بۆ دوو زمان و سیخوڕەکان مەهێنە سەرزمان بڕوا بەفریوکارەکان مەکە و لەگەڵ خراپەکار پەیوەندی هاورێیەتی مەبەستە و هەژارەکان لەخۆت مەتارێنە و بێهۆ قسە مەهێنەرە سەرزار، سەیری ئەو کەسە مەکە بەردەوام گاڵتە دەکات و بەڵێنەکانی خۆت بەدیبێنە. لەخراپەکار بترسە و بێ ئاوزی بەکار مەبە، تورەیی خۆت دەرمەبڕە و سەرمەستانە رێگە مەبڕە و بۆ بەدەست هێنانی ئەو دنیا زێدەڕۆیی مەکە پیشە، جوێن بەرۆژگار مەدە و لەترسا، چاو لەستەمکار مەپۆشە و بەدوای پاداشتی ئەو دنیا لەم دنیادا مەگەڕێ؟

بەردەوام راوێژ بەزانا و شارەزایانی دین بکە و خۆڕاگربە، لەئەزمونی زاناکان و فرەزانەکان وانە وەربگرە، راوێژە بەئەهلی زەممە و باوەڕداران بەئایینەکانی دیکە مەکە، گوێ لەقسەکانیان مەگرە چوونکە زیانی ئەوان زیاتر لەسوودیانە. بزانە ئەگەر تەماحکار بیت، زیاتر وەردەگریت و کەمتر دەدەیت و هەر کات بەم شێوەیە بیت، تەنیا کەمێك کاروبارەکانت سامان دەگرێت. خەڵك ئەو کاتە تۆیان خۆش دەوێت کە لەسامانی ئەوان چاو بپۆشیت و ستەمیان لێ نەکەیت، دڵخۆشی ئەوان

لەگەڵ دەست بڵاوی و بەخششی تۆ پەیوەست دەبێت.

لەرژدی خۆت بەدوور بگرە چوونکە یەکەم نافەرمانی مرۆڤ لەبەرابەر پەروەدگارە و نافەرمان لەپێگەی ریسواییدایە و ئەمە هەمان فەرموودەی پەروەدگارە کەدەفەرمێت (( هەرکەس لەرژدی نەفسی خۆی بەدوور بێت، ئەوان رزگاریان دەبێت))[٤] بۆ هەموو موسوڵمانان لەدڵدا بەهرەیەك لەبەرچاو بگرە و بڕوات بەوە بێت بەخشش لەلەپێشترین کارەکانە، کەواتە بیکە عادەتێك و رێگەی بەخشش بەراستی تەخت و لەکردەوە و ئایین پێی دڵخۆش بە. لەکاتی خۆیدا مانگانە و رۆژی بەسوپاییەکان بدە و ژیانیان خۆش بکە تا خواوەند بەهۆی تۆوە هەژاری ئەوان بسرێتەوە و زیاتر لەجاران فەرمانبەری فەرمانەکانی تۆبن.

دەوڵەمەند ئەم بەختەوەرییەی بەسە لەرووناکی دادپەروەری و بەرابەری و خۆشەویستی و چاکەکاری ویەکساری، هۆکاری رەحمەت سوپا و هاولاتیان بێت.

داوەری دادپەروەرانە لای خواوەند بەرادەیەك بایەدارە کەنەشیاوە بۆ بەراوەرد کردن لەگەڵ هیچ شتێك چوونکە ئەوە شایەنی خواوەندییە کردەوەکانی خەڵکی لەسەر زەوی پێ کێشان دەکرێت و بەسەقامگیر کردنی داد و دادپەروەری و کارە کردەوە و بارودۆخی خەڵك سەقامگیر دەبێت و رێگەکان ئەمان و ستەملێکران بەمافی خۆیان دەگەن و خەڵکان مافەکانیان بەدەست دێنن و ژیان خۆش و مافی فەرمانبەران دەدرێت خواوەند تەندروستی و بەختەوەری دەبەخشێت و دین بەهێز و سوونەتەکان دەبوژێنەوە.

بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند سەختگیر بە و لەخراپەکاری داوێنی خۆت بەدوور بگرە و سنورە خواییەکان بپارێزە، نیگەران مەبە و بەسوێند بەسەندە بکە و لەئەزمونی خۆت کەڵك وەربگرە. لەبێدەنگی خۆت بیرمەند و وتەی شیاو و بەپێز بێنە سەرزمان، دادی دوژمن وەربگرە و لەکاتی گومان پەلە مەکە، بەڵگەی بەهێزت هەبێت، نە لەهیچ کام لەژێردەستەکانت بترسە و نەپشتی کەس بگرە و نەگرنگی بەسەرکۆنەی سەرکۆنەکەر بدە، بیربکەرەوە و ماف وراستی بەسەر خۆیشت بسەپێنە، ئەندێشە بکە و وانە وەربگرە و لەبەرابەر خواوەند، لەخۆبوردووبە،

---

[٤] و من یوق شح نفسه فاولئك هم المفلحون. حشر/٩

ژێردەستەکانت خۆش بەوێت.

بۆ ڕشتنی خوێنە پەلە مەکە چوونکە ئەگەر خوێنێك بەناڕەوا بڕژێت، لای خواوەند گوناحێکی گەورەیە، سەیری باج بکە کەخەڵکان دەیدەن و خواوەند کردوویەتی بەکۆڵەکەی ئیسلام و بۆ دوژمنان هۆکاری سەرکوت کردن و بۆ باوەڕان ریسوایی بەدیهێناوە، کەواتە باج لەناو هاوەڵانت دادپەروەرانە دابەش بکە. لەوەرگرتنی باج لەرێزدار بەبیانوی رێزدار و لەدەوڵەمەند بەهۆی دەوڵەمەندی و لەدەبیر و هیچ کام لەکەسە نزیکەکانی خۆت مەدزرەوە و لەهیچ کەس زیاتر لەتوانای خۆی مەستێنە، زیاتر لەتوانای خۆیان مەخە سەرشان و تاڵی راستییان پێ بچێژە چوونکە ئەمە زیاتر دەبێتە هۆی کۆبوونەوە و رەزامەندی ئەوان.

فەرمانڕەواییان بەتۆ بەخشیوە تا پاسەوان بیت و پارێزەری مسکێنەکان. خەڵکانی سنوورەکەی تۆ بەمسکێن ناو دەبەن چوونکە تۆ شوان و سەرپەرەستی ئەوانیت. ئەوەی بەرەزامەندی خۆیان بەتۆی دەدەن، وەریدەگریت و سەرقاڵی سامان دانی بارودۆخ و لەناو بردنی چەوتییەکان دەبیت، کەواتە بیرمەندان و زانایان و داوێن پاك و سیاسەتبازان بکەرە فەرماندەی ئەوان و رۆژانەیەکی بەرچاویان بۆ دیاریبکە چوونکە ئەمە یەکێکە لەئەرکەکانی تۆ و نابێت هیچ شتێك بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە رێگری لەتۆ بکات.

لەهەر ناوچەیەك لەسنوری ژێردەسەڵاتی خۆت کەسێکی بڕواپێکراو دەستنیشان بکە تا لەکردەوەی کارگوزارەکانت ئاگادارت بکاتەوە و شێوە و هەڵس وکەوتی ئەوان بۆ تۆ بنوسێت بەو شێوەی وەك بڵێی هاورێی کارگوزارەکانتی و چاودێری کردەوەکانیان دەکەیت. هەرکات مەبەستی ئەوەت کرد فەرمانیان پێ بدەیت، لەدواهاتەکانی ئەم فەرمانە بڕوانە و ئەگەر دواهاتەکەی راست هاتە بەرچاو و هیوای چاکەت لێ برد، بەئەنجامی بگەیێنە و گەرنە دەست راگرە و لەگەڵ زانا و شارەزایان راوێژ بکە. ئەگەری هەیە کەسێك لەکارەکانی خۆی بڕوانێت و بەسازگاریان ببینێت و ئەمە ببێتە هۆی فریوخواردنی بەڵام دواهاتی کارەکەی، ببێتە هۆکاری لەناوچوونی و رشتەی کارەکانی بپچڕێنێت. کەواتە لەمەبەستەکانی خۆت، سەیری دوارۆژ بکە و دوای پشت بەستن بەخوا؛ هێز و توانای خۆت بەکار

بیە. لەهەموو کارەکان داوای هاوکاری لەخواوەند بکە، لەکاتی خۆیدا کارەکانت ئەنجام بدە و بۆ ڕۆژی دواتر دوایان مەخە چوونکە ڕۆژی دواتر کاری تایبەت بەخۆی هەیە و تۆ لەئەنجامدانی کارەکانی دوێنێت، دوور دەخاتەوە.

بزانە ئەمڕۆ، ئەو ساتەی تێدەپەڕێت، بەهەموو شتەکانییەوە دەڕوات و ئەگەر درەنگ بەئەنجامیان بگەیێنیت، کاروبارەکانی دوو ڕۆژ دەکەوێتە سەر شانی تۆ و ئەمە دەبێتە هۆی دوور خرانەوەی تۆ لەئەنجامدانی کارەکان بەشێوەی شیاو و پێویست.

نیازی بنەماڵەکەت دابین بکە و خەرجی ئەوان بگرە ئەستۆ، خۆشی ژیانیان بۆ دابین بکە بۆ ئەوەی بێ نیاز بن. خۆت لێپرسینەوە لەنیازی هەژاران و نەداران و ئەو کەسانەی توانای دادخوازی لەتۆیان نییە، بگرە ئەستۆ. بەردەوام لەحاڵی ئەو کەسانە بپرسە و کەسانی شیاو بۆ لێپرسینەوە لەبارودۆخی ئەوان ڕاسپێرە تا نیازەکانی ئەوان بەگوێی تۆ بگەیێنن و تۆ بەشێوەیەك لێکۆڵینەوە لەنیازەکانیان بکەیت کەخواوەند نیازەکانیان بۆ دابین دەکات.

جەنگاوەر و هەتیو و بێوەژنەکان بدۆزەرەوە و بەلاسایی کردنەوەی سەروەری باوەڕداران، لەگەنجینە، ڕۆژانەیان بۆ دیاری بکە، خۆشەویستی خۆتیان بۆ دەربڕە تا بەم شێوەیە خواوەند سامان بەژیانیان بدات و بەرەکەت و فراوانی نیعمەت بکاتە بەشی تۆ. بۆ پیاوە سەخت و نەشیاوەکان بۆ سازان بەشێك لەگەنجینە دیاریبکە، قورئان خوێنەکان و حافزانی قورئان پێش کەسانی دیکە بخە، بۆ موسوڵمانان نەخۆشخانەیەك دروست بکە تا ببێتە پەنایان و کەسانێك بۆ پەرەستاری کردنیان ڕاسپێرە لەگەڵ ئەو پزیشکانەی نەخۆشییەکانیان دەرمان بکەن.

ئاگاداربە ئەو کاتەی مافی خەڵکان دەدرێت و نیازەکانیان بەراوەردە دەکرێت ڕەزامەند و دڵخۆش نابن تا ئەوەی نیازەکانی خۆیان بەکارگوزارەکەیان بڵێن بۆ ئەوەی بڕێکی زیاتریان دەستکەوێت و خۆشەویستی زیاتر بەدەست بێنن، ئەگەری هەیە ئەو کەسەی لێپرسینەوە لەکاروباری خەڵك دەکات، لەفراوانی ئەوەی بەدەستی دەگات و بیر و هزری بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات، ناتەوان بێت. ئەو کەسەی شوێنکەوتەی دادپەروەری بێت و دواهاتەکانی چاکەکاری لەهەردوو دنیا

بزانێت، هاوشێوەی ئەو کەسە نییە هۆکارەکانی نزیك بوونەوە لەخواوەند بەدوژار بزانێت و لەگەڵ ئەوەیشدا چاوەڕوانی بەخششی خواوەند بێت.

کاتێك دەبەخشیت، روو کراوە بە و بێ هیچ دڵگرانییەك، بۆ چاکەکاری خۆت بەدوای پاداشت مەگەڕێ چوونکە بەخششێکی لەم شێوەیە ـ بەخواستی خوا- مامڵەیەکی سودهێنەرە.

لەرابردوانی دنیا و فەرمانڕەوا و پاشاکان و نەتەوە لەناوچووەکان وانە وەربگرە و بەردەوام پشت بەخوا ببەستە و رێگەی دینی خواوەند بگرەبەر و لەوەی رێگری لێ دەکات، خۆت بەدوور بگرە و ئەوەی دەبێتە هۆی تورە بوونی خواوەند، ناسازگاری لەگەڵ بکە. لەو سامانەی کارگوزارەکانی تۆ کۆی دەکەنەوە و لەوەی خەرجی دەکەن، ئاگادار بە. سامانی ناڕەوا کۆمەکەرەوە و لەخەرج کردن زێدەڕۆیی مەکە.

بەردەوام هاونشینی زاناکان بە و راوێژیان پێ بکە، دەبێت خواستی تۆ شوێنکەوتنی سوونتەکان و زیندوو کردنەوەی و هەڵبژاردنی کارە چاکەکان بێت. رێزدارترینی کەسان و نزیکەکانی تۆ کەسێك بێت کەشکۆی تۆ نەبێتە هۆی ئەوەی باسی ئیراد و رەخنەکانت نەکات و کەمی و کورییەکان نەهێنێتە سەرزمان چوونکە ئەم دەستەیە چاکەخوازترین و باشترین پشتیوانەکانی تۆن. سەیر کارگوزار و دەبیرەکانی بارەگاکەت بکە و بۆ هەرکام کاتێك تەرخان بکە تا نامەکان بێنە لای تۆ و لەنیازی کارگوزاران و هاوڵاتییەکان ئاگادارت بکەنەوە. دواتر بەگوێ و چاوی عەقڵ و هزر و ئاوز، جێبەجێیان بکە و ئەوەی لەگەڵ راستی و دوورئەندێشی یەك دەگرێتەوە، ئەنجامی بدە و پشت بەخوا ببەستە و داوای هاوکای لەو بکە و ئەوەی لەگەڵ خواستی خواوەند ناسازگار بوو، پشتگوێی بخە.

ئەم نامەیە بەجوانی بخوێنەرەوە و بەقووڵی ئەندێشەی لێ بکە و بەکاری ببە. لەهەموو کارەکان داوای هاوکاری لەخواوەند بکە و داوای چاکەی لێ بکە چوونکە خواوەند لەگەڵ راستی و راستی خوازانە. دەبێت باشترین حەز و خواستەکانی تۆ بۆ رەزامەندی پەروەردگار بێت چوونکە ئەو، دین بەهێز دەکات و پێگەی بەرز بەدینداران دەبەخشێت و پەیمان و راستی و دادپەروەری دەپارێزێت.

خواوەند تۆ رزگار بکات و هاوڕێ و پشتیوانی تۆ بێت و باشترین و چاکترین نیعمەتەکانت پێ ببەخشێت.

کاتێك خەڵك لەم نامەیە ئاگادار بوونەوە، دەست بەدەست بردیان و چەندین ڕوونووسیان لێ نووسیەوە و مەئمون ئاگادار بوویەوە. فەرمانیدا نامەکەی بۆ بخوێننەوە. دواتر وتی: باوکی تەییب (تاهیر) هیچ وتەیەکی لەکار دین و دنیا و فەرمانڕەوایی و ڕاوێژ و سیاسەت و سامان دان بەفەرمانڕەوکان و شارۆمەندان و ڕێز گرتن و پاراستنی فەرمانڕەوایەتی و فەرمانبەری لەفەرمانڕەوکان نەهێناوەتە سەرزمان، مەگەر ئەوەی پشت ڕاستی کردۆتەوە و بەڵگەی بۆ هێناوە و پێشنیاری بەهەموان کردووە. مەئمون فەرمانیدا ئەم نامەیە بۆ هەموو کارگوزارەکانی لەهەموو ناوچەکان بنووسن. عەبدوڵلە بەرەو سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی بەرێکەوت و ئەوەی باوکی پێشنیاری کردبوو، بەکاری بردو هەنگاوی خستە شوێن پێی ئەو.

## مەرگی حەکەم کوڕی هوشام

لەبیست و شەشی زیحەججەی ئەم ساڵە/ ٢٦ مەی ٨٢١ زایینی حەکەم کوڕی هوشام کوڕی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس مرد. بەیعەتی ئەو وەك خەلیفەی ئاندۆلۆس لەسەفەری ساڵی سەد و هەشتای کۆچی/ ١٤ ئاوریلی ٧٩٨ زایینی بوو. ساڵەکانی ژیانی پەنجا و دوو ساڵ درێژەی کێشا. نازناوی ئەو باوکی عاس و دایکی دایکی منداڵ (کەنیز) بوو. بالآیەکی بەرز، گەنم ڕەنگ و لەڕ بوو. نۆزدە کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت. عەبدولرەحمان هۆنراوی تەنز ئامێزی دەهۆنییەوە. یەکەم کەس بوو لەئاندۆلۆس سوپای موچەوەرگری پێکهێنا و کەرەستەی جەنگ و توێشوی پاشەکەوت کرد وکەسانێکی زۆری لەدەوری خۆی کۆکردەوە. سوارکارە فراوانەکانی بۆ پاسەوانی کردن لەدەوروبەری کۆشکەکەی ڕاسپارد و بەردەوام ئەوانی ئامادە بۆ جەنگ هێشتەوە. هاوشێوەی پاشا لەخۆبایی و خۆپەسەندەکان بوو. کۆیلە بەزێرکراوەکانی پەیوەستی سوپاکەی خۆی کرد. ژمارەی ئەم کۆیلانە دەگەیشتە پێنج هەزار کەس. ئەم کۆیلانەیان بەلاڵ ناو دەبرد چوونکە زمانی عەرەبییان نەدەزانی. ئەوان هەموو ڕۆژێك لەکۆشکەکەی حەکەم ئامادە بوون. ئەو

ئاگاداری هەموو کارە دوور و نزیکەکان بوو. دەستەیەکی بڕواپێکراوی پێکهێنا کەگوێیان لەسکاڵای خەڵکان دەگرت و داد و مافی ئەوانیان دەستاند و هاوکاری ستەملێکراوانیان دەکرد. بوێر و پێشەنگ و روخسارێکی بەشکۆی بوو. ئەو بوو بناغەی فەرمانڕەوایەتی ئومەوییەکانی لەئاندۆلۆس بەهێز کرد و پیاوانی ئایینی و شارەزایانی لەخۆی نزیك کردەوە.

## فەرمانڕەوایی عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم

کاتێك حەکەم کوڕی هاشم مرد، کوڕەکەی عەبدولرەحمان بەنازناوی باوکی موتەریف جێگەی باوکی گرتەوە. دایکی ئەو بەحەلاوە (شیرینی) ناودەبرا. ئەو بەنازناوی باوکی ناودەبرا. عەبدولرەحمان لەرۆژگارێك کەباوکی حەکەم لەلایەن باوکی هوشامەوە فەرمانڕەوایەتی تۆڵدۆی (تەلیتەڵە) دەکرد، حەوت مانگە چاوی بەدنیا هەڵهێنا. رۆژی لەدایك بوونی بەدەستی باوکی نوسراوە.

عەبدوالله بەهێز و جوان بوو. کاتێك کە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت، کوڕی مامەکەی، عەبدوالله بەلەنسی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و مەرگی حەکەمی بەدەرفەت زانی و لەوالێنسیاوە رووی کردە کۆردۆبا. عەبدولرەحمان سوپاکەی خۆی لەبەرابەر ئەو رازاندەوە. کاتێك عەبدوالله ئەم هەواڵەی بیست، ترسا و بەباشی زانی بۆ والێنسیا بگەڕێتەوە. لەم بگرە وبێنەدا مرد و خواوەند جەستەی ئەوی لەسەر زەوی سڕییەوە.

کاتێك عەبدوالله مرد، عەبدولرەحمان ژن و منداڵەکانی ئەوی هێنایە کۆردۆبا و فەرمانڕەوایی ئاندۆلۆس تایبەت بوو بەمنداڵەکانی هوشام کوڕی عەبدولرەحمان.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی موسای ئەشیب لەدادیاری موسڵ دوورخرایەوە و رێگە بەغدادی گرتەبەر. عەلی کوڕی ئەبی تالبی موسڵی جێگەی ئەوی وەك دادیاری موسڵ گرتەوە.

لەم ساڵەدا مەئمون کاروباری جەنگی لەگەڵ زۆتەکان [°] و دەوروبەری بەسرە و گوندەکانی دیجلە و یەمامە و بەحرەینی بەداوود کوڕی ماسحور سپارد.

لەم ساڵەدا ئاوی دیجلە بەرادەیەك بەرز بوویەوە کەدەوروبەری عێراق و کەسکەر و گوندەکانی دایکی جەعفەر کەوتە ژێر ئاو و زۆربەی کێڵگە کشتوکاڵییەکان لەناوچوون.

لەم ساڵەدا بابەکی خورەمدین، عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالیدی لەناو برد. عوبەیدالله کوڕی حەسەنی عەلەوی سەرپەرەستی ئارامگای پێغەمبەر(د.خ)، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا موسوڵمانانی ئەفریقا لەگەڵ خەڵکانی دوورگەی سەردانییە جەنگان و تالآنی زۆریان دەستکەوت و بەسەر ناباوەڕاندا زاڵ بوون. ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ژمارەیەکیان لێ کوژرا و گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا هەیسەم کوڕی عودەی تایی ئەخباری مرد. هەرچەند بەردەوام سەری لەسوجدەدا بوو بەڵام حەدیسەکانی لاوازە. هەروەها عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی باوکی ئومەییەی موسڵی لەهاورێیانی سوفیانی سەوری، چاوی لەجیهان بەست.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی موستەنیر ناسراو بەقوترەبی نەحوی مرد کەزانست لەسیبویە فێر ببوو.

لەم ساڵەدا باوکی عەمرۆ ئیسحاق کوڕی میراری شەیبانی لوغەوی کۆچی دوایی کرد.

---

[°] - زۆت واشەی بەعەرەبی کراوی جاتە. ئەم خەڵکە پێش ئیسلام لەبەندەرەکانی کەنداوی فارس لەکەنارەکانی هیند دەژیان و دواتر بۆ ئێران و لەوێوە بۆ ڕۆژهەلأتی ئاسیا و سەرئەنجام بۆ ئەوروپا کۆچیان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەوتی کۆچی ( ٨٢٢ زایینی )

## شۆڕشی عەبدولڕەحمان کوڕی ئەحمەد لەیەمەن

لەم ساڵەدا عەبدولڕەحمان کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەرزەمینی عەکی یەمەن ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو پێشنیاری ڕەزامەندی بنەماڵەی محەممەدی بەخەڵکان دەکرد.

هۆکاری شۆڕشەکەی ئەوە بوو کارگوزارانی یەمەن بەشێوەیەکی خراپ هەڵس و کەوتیان لەگەڵ خەڵکان دەکرد و خەڵکان، دەستی بەیعەتیان بۆ عەبدولڕەحمان درێژ کرد. کاتێك مەئمون ئاگادار بوویەوە، دیناری کوڕی عەبدوڵڵەی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ سەرکوت کردنی ڕەوانە کرد. مەئمون ئەمان نامەیەکی بۆ عەبدولڕەحمان نووسیبوو. دینار لەکاتی حەج ڕۆشتە سەردانی ماڵی خواوەند و دواتر ڕێگەی یەمەنی گرتەبەر و ئەمان نامەکەی بۆ عەبدولڕەحمان نارد. عەبدولڕەحمان ڕازی بوو و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی مەئمون نیشاندا و دەستی خستە ناو دەستی دینار. دینار ئەوی بردە لای مەئمون. مەئمون مۆڵەتی سەردانی بەخۆی و بنەماڵەی ئەبوتالب نەدا تا ئەو کاتەی جل و بەرگی ڕەش بپۆشن. ئەم ڕووداوە لەبیست و هەشتی زیقەعدە/ ١٢ ئاوریلی ٨٢٢ زایینی ڕوویدا.

## مەرگی تاهیر کوڕی حسەین

لەجومادی الاولی ئەم ساڵە/ ٢١ سێپتامبەر تاهیر کوڕی حسەین بەهۆی ئەو (تا)ی پێوەی گرفتار بوو، کۆچی دوایی کرد. ئەویان لەناو جێگەکەی بەمردووی دۆزییەوە.

کولسوم کوڕی سابت کوڕی باوکی سەعید دەڵێت: سەرپەرەستی بەریدی خوراسان بووم. لەساڵی دووسەد و حەوتی کۆچی، هەشتسەد و بیست و دووی زایینی لەنوێژی هەینی ئامادە بووم، تاهیر ڕۆشتە سەرمینبەر و وتارێکی خوێند، کاتێك گەیشتە ناوی خەلیفە، دۆعای نەکرد و وتی: ئەی خوایە، ئۆمەتی محەممەد بەو شێوەی ئەوت هێنایە سەر ڕێگەی ڕاست، بێنەرە سەر ڕێگەی ڕاست و ڕەنج و

بەڵای ئەو کەسەی یاخی دەبێت و سوپا کۆدەکاتەوە و خوێن دەرژێنێت، لەناو ببە.

کولسوم کوڕی سابت دەڵێت: بەخۆم وت: من یەکەم کوژراوی ئەم پێشهاتەم چوونکە ناتوانم ئەم کارەی تاهیر لەمەئمون بشارمەوە. دەڵێت: گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، غوسڵی مردووم کرد، کفنم پۆشی و هەواڵەکەم بۆ مەئمون نارد. بۆ ئێوارێ، تاهیر منی بانگ کرد. برینێك لەپێڵوەکانی دروست ببوو و سەرئەنجام کوشتی. تەڵحە کوڕی تاهیر بەرەو لای من رایکرد و وتی: ئایا تۆ هەواڵەکەت بۆ مەئمون ناردووە؟ وتم: بەڵێ. وتی: کەواتە هەواڵی مەرگی دەستبەجێی ئەو بۆ مەئمون بنوسە. مەئمونم لەمەرگی تاهیر ئاگادار کردەوە. هەروەها نووسیم هەنووکە تەڵحە فەرماندەی سوپایە. نامەی سەربەمۆری لەسەر کار لابردنی مەئمون لەلایەن تاهیریان هێنا ( ئەمە نامەی کولسوم کوڕی سابت بوو). مەئمون ئەحمەد کوڕی باوکی خالیدی بانگ کرد و پێی وت: بڕۆ و بەهەمان شێوە کەبوویتە دەستەبەری تاهیر، لەگەڵ خۆت بیهێنە. ئەحمەد کوڕی باوکی خالید وتی: ئەمشەو بمێنمەوە؟ مەئمون وتی: نا، بەڵام ئەحمەد پێداگری کرد تا ئەوەی مەئمون مۆڵەتی ئەو کارەی پێدا. هەمان شەو نامەیەکی سەر بەمۆری دیکە کەهەواڵی مەرگی تاهیری تیا نوسرا بوو، گەیشت. مەئمون ئەحمەد کوڕی باوکی خالیدی بانگ کرد و لەمەرگی تاهیر ئاگاداری کردەوە، وتی: چ کەسێك بۆ جێگرتنەوەی ئەو بەشیاو دەزانیت؟ وتی: تەڵحەی کوڕی. مەئمون وتی: فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ بنووسە. ئەحمەد فەرمانەکەی نووسی. تەڵحە لەرۆژگاری مەئمون بۆ ماوەی حەوت ساڵ فەرمانڕەوای خوراسان بوو و دواتر مرد و عەبدوڵلەی برای جێگەی گرتەوە.

دەڵێن: کاتێك مەئمون لەمەرگی تاهیر ئاگادار بوویەوە، دوودەستی بەرز کردەوە و وتی: سپاس بۆ خواوەند کەمەرگی ئەوی پێش خست. تاهیر یەك چاوی بوو، لەبەر ئەمە شاعیرێك وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| یا ذا الیمنین و عین واحدة | نقصان عین و یمین زائدة |

واتاکەی: ئەی ئەو کەسەی دوو دەستی راست و یەك چاوت هەیە، چاوێکی کەمتر هەیە و دەستێکی زیاتر.

نازناوی تاهیر زووئەلیەمینەین و باوکی تەییب بوو. دەڵێت ئەو کاتەی تاهیر

مرد. سوپاییەکان بەشێك لەگەنجینەی ئەویان تالآن کرد. سەلام کوڕی ئەبرەشی خەساو کاروباری ئەوانی ڕێکخست و ڕۆژانەی شەش مانگی پێدان. هەروەها دەڵێن مەئمون، عەبدوالله کوڕی تاهیری کردە فەرماندەی هەموویان و ئەو، تەڵحەی برای ڕەوانەی خوراسان کرد چوونکە عەبدوالله خۆی لەرەققە سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ نەسر کوڕی شەبەس بوو. کاتێك تەڵحە روویکردە خوراسان، مەئمون، ئەحمەد کوڕی باوکی خالیدی وەك راوێژکاری ئەو ڕەوانە کرد تا لەبەرێوەبردنی کاروبارەکان هاوکاری بکات. ئەحمەد لەماوەرا ئەلنەهر گوزەری کرد و دەستی بەسەر ئەشروسەنەدا گرت و کاوس کوڕی خاراخەرە و فەزڵی کوڕی ئەسیر و ڕەوانەی بارەگانی مەئمونی کردن. تەڵحە سێ هەزار درهەمی وەك دیاری بەئەحمەد کوڕی باوکی خالید کرد لەگەڵ چەندین خەلآتی و پێشکەشی دیکە بەبەهای دوو هەزار هەزار درهەم. هەروەها پێنسەد هەزار درهەمی بەدەبیرەکەی و ئیبراهیم کوڕی عەباس بەخشی.

## ڕووداوەکانی ئاندۆلۆس لەم ساڵەدا

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم سوپا و خەڵکی بەسراتی لەجەنگێك بەناوی بالس کوشتار کرد.

هۆکاری ئەم کۆمەڵکوژییە ئەوە بوو حەکەم ئاگادار بوویەوە کەکارگوزارێك بەناوی رەبیع ستەم لەئەمان بەخشراوەکان دەکات. حەکەم ئەوی زیندانی و پێش مەرگی خۆی چوارمێخەی کێشا. کاتێك حەکەم مرد و عەبدولرەحمانی کوڕی هاتە سەر تەخت، خەڵکان هەواڵی کوژرانی رەبیعیان بیست و لەبەر ئەمە روویان کردە کەنارەکانی کوردوبا و داوای ئەو سامانەیان کرد کەرەبیع تالآنی کردبوو. گومانیان دەکرد دەبێت ئەم سامانە بۆ ئەوان بگەڕێنرێتەوە. خەڵکانی ئەلیبەرە زیاتر لەخەڵکانی دیکە بۆ وەرگرتنەوەی ئەم سامانە پێداگرییان دەکرد و سوپایان ڕازاندەوە. عەبدولرەحمان کەسی بۆ ناو ئەوان نارد تا بلآوەیان پێبکات بەلآم ڕازی نەبوون و نێردراوەکانیان گەڕاندەوە. دەستەیەك لەسوپاییەکانی عەبدولرەحمان بۆ جەنگی ئەوان پێشڕەوییان کرد و ئاگری جەنگ هەڵگیسرا. سوپاکەی ئەلیبەرە و

هاورێکانیان شکستیان خوارد و بەریسوایی کوشتار کران و پاشماوەکان هەڵاتن. سوپاکەی عەبدولرەحمان شوێن هەڵاتووان کەوتن و ئەوانیشیان کوشت.

لەم ساڵەدا تەدمور، لەنێوان موزێر و یەمانییەکان ئاژاوە سەریهەڵدا و لەلۆرکا (لۆرقە) جەنگان. ئەم جەنگە بەناوی جەنگی رۆژی موزارە (یوم المضارە) ناسراوە کەتیایدا سێ هەزار کەس لەخوێنی خۆیاندا گەوزان و بۆ ماوەی حەوت ساڵ درێژەی کێشا. یەحیا کوڕی عەبدوالله کوڕی خالید لەگەڵ سوپایەك بەرێکەوت تا رێگەی لەرووودانی جەنگ بگرێت. کاتێك ئەوان لەهاتنی یەحیا ئاگادار بوونەوە، هەردەستە و بەرەو ناوچەیەك هەڵاتن و دەستیان لەجەنگ هەڵگرت بەڵام کاتێك یەحیا ناوچەکەی بەجێدەهێشت دەگەڕانەوە و سەر لەنوێ ئاگری جەنگیان خۆش دەکرد تا ئەوەی هەردوولا بەتەواوی لاواز و ناتەوان بوون.

لەم ساڵەدا لەئاندۆلۆس وشکەساڵییەکی ئەوتۆ روویدا کەگیانی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی گرت و لەهەندێ لەشارەکان بەهای یەك (مۆد) دانەوێڵە بۆ سی دینار بەرزبوویەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا لەعێراق گرانی هاتە ئاراوە و بەهای یەك قەفیزی هارونی (پێوانەی ئەو رۆژگارە) بۆ چل تا پەنجا درهەم بەرز بووەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی حەفس فەرمانڕەوایی تەبەرستان و رویان و دەماوەندی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا باوکی عیسا، منداڵەکەی ڕەشید، رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا مەئمون، فەرمانی بەسەیید کوڕی ئەنس کارگوزاری موسڵدا هێرش بکاتە سەر منداڵەکانی شەیبان و دەستەیەکی دیکە لەعەرەبەکان کە لەشارەکان ستەمکارییان کردبووە پیشە. سەیید هێرشی کردەسەریان و لەدەسکەرە سەرکوتی کردن و خوێنی زۆر لەوانی ڕشت و سامانەکانی تاڵان کرد و گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا وەهب کوڕی جەریری فەقیە و عومەر کوڕی حەبیبی

عەدەوی دادیار و عەبدولسەمەد کوڕی عەبدولوارس کوڕی سەعید و عەبدولعەزیز کوڕی ئەبانی قورەشی دادیاری واست و جەعفەر کوڕی عەون کوڕی جەعفەر کوڕی عەمرۆ کوڕی حورەیسی مەخزومی فەقیە و بیشر کوڕی عومەری خۆپارێز و فەقیە و کەسیر کوڕی هوشام و ئەزهەر کوڕی سەعیدی سەمان و باوکی نەزر هوشام کوڕی قاسمی کەنانی، مردن.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عومەر کوڕی واقدی واقدی لەتەمەنی حەفتا و هەشت ساڵی مرد. ئەو مێژووی جەنگ و غەزوەکان و جیاوازی ڕووانگەی زاناکانی بەباشی دەزانی بەڵام حەدیسەکانی لاوازە.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی باوکی ڕەجای قازی لەهاوەڵانی باوکی یوسف قوتابی ئەبو حەنیفە، چاوی لەجیهان بەست.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی باوکی عەبدوڵڵە کوڕی عەبدولعەلی ناسراو بەکوڕی کەناسە، خوشکەزای ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم، کەعەرەبی بەباشی دەزانی و هۆنراوەی دەهۆنییەوە و پسپۆڕی بواری مێژوو بوو. وەڵامی بانگەوازی فریشتەی مەرگی دایەوە.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی زیاد و باوکی زەکەریای فەرانەحوی کوفی و باوکی غانمی موسڵی و زەید کوڕی عەلی کوڕی باوکی خودائاسی موسڵی کە لەهاوەڵانی موعافی بوو و حەدیسی زۆریان لێ گێڕاوەتەوە، هەموویان مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتی کۆچی (٨٢٣ زایینی)

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی حسەین کوڕی موسعەب (برای تاهیر) لەخوراسانەوە ڕووی کردە کرمان و لەوێ ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەحمەد کوڕی باوکی خالید بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕۆشت و ئەسیری کرد و هێنایە بارەگای مەئمون بەڵام مەئمون لێی خۆش بوو.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی حیماد کوڕی باوکی حەنیفە، وەك دادیار دەستنیشان کرا. لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمانی مەخزومی لەدادیاری سوپای مەهدی دوورخرایەوە و بیشر کوڕی وەلیدی کێندی جێگەی ئەوی گرتەوە. یەکێك لەشاعیرەکان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| یا ایها الرجل الموحد ربه | قاضیك بشر بن الولید حمار |
| ینفی شهادة من یدین بمابه | نطق الکتاب و جاءت الاثار |
| و یعد عدلا من یقول بأنه | شیخ یحیط بجسمه الاقطار |

واتاکەی: ئەی ئەو کەسەی باوەڕت بەتاقانەیی خواوەند هەیە، بزانە کەدادیارەکەت، بیشر کوڕی وەلید کەرە ئەو بەشایەتی کەسێك کەباوەڕی بەفەرموودەکانی خواوەند و حەدیسەکان هەیە، ڕازی نابێت و بەپێچەوانەوە بەوتەکانی ئەو کەسەی دەڵێت: (خواوەند پیرێکی بەهێزە)پەسەند دەکات.

لەم ساڵەدا موسا کوڕی ئەمین و فەزڵ کوڕی ڕەبیع لەزیقەعدە/ ٦ مارسی ٨٢٣ زایینی مردن و ساڵحی ڕەشید ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا یەسع کوڕی باوکی قاسمی واسول فەرمانداری سیجلماسە مرد و دانیشتووانی ئەو شارە، مونتەسیر کوڕی باوکی قاسم ناسراو بە مێدراریان وەك فەرمانداری خۆیان هەڵبژارد. پێشتر ئاماژەمان پێداوە.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ سەرزەمینی ناباوەڕان ڕەوانە کرد و عەبدولکەریم کوڕی عەبدولواحید کوڕی موغیسی کردە فەرماندەی ئەوان. ئەم سوپایە بەرەو الله و قەڵاکانی بەرێکەوتن و ئەم کەنارانەیان تاڵان کرد و سوتاندیان. گەمارۆیان خستە سەرچەندین قەڵا و

دەستیان بەسەردا گرت و چەند قەلایەك بەدانی باج رازی بوون و ئەسیرە موسوڵمانەکانیان ئازاد کرد و رێگەی ئاشتییان گرتەبەر. لەم جەنگانەدا عەبدولکەریم تالانی زۆری کۆکردەوە. سوپاکەی ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانە ئەسیرەکانی ئازاد کرد. ئەم رووداوانە لەجومادی الاخر/١٠ ئۆکتۆبەری ٨٢٣ زایینی روویاندا و سەرئەنجام هەموویان تەندروست گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی عەبدولرەحمانی ئومەوی ناسراو بەبەلەنسی، فەرمانڕەوای والێنسیا (بەلەنسە) کۆچی دوایی کرد. چەند و چۆنیەتی ژیان و بەسەرهاتەکانی ژیانی ئەومان لەگەڵ برازاکەی باس کرد.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی ئەبوبەکر کوڕی حەبیبی سەهمی باهلی و یونس کوڕی محەممەد ی مۆئەدەب و قاسم کوڕی رەشید و سەعید کوڕی تەمام لەبەسرە و عەبدوالله کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمان کوڕی عەلی و حەسەن کوڕی موسای ئەشیب کەوەك دادیاری تەبەرستان دیاری کرابوو، مردن. حەسەن کوڕی موسا لەرەی مرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی موبارەکی ئەحمەر، قوتابی کەسائی مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بەسەد و هەشتا و شەش/ ٨٠٢ زایینی دەزانن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نۆی کۆچی ( ٨٢٤ زایینی )

### سەرکەوتن بەسەر نەسر کوڕی شەبەس

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی تاهیر لەقەڵای کیسوم گەمارۆی خستەسەر نەسر کوڕی شەبەس و بەرادەیەك بارودۆخی لێ دژوار کرد کەنەسر داوای ئەمانی کرد. محەممەد کوڕی جەعفەری عامری دەڵێت: مەئمون بەسەمامە کوڕی ئەشرەسی وت: ئایا کەسێك لەخەڵکانی جەزیرە بەمن دەناسێنیت کەهەم بیرمەند بێت و هەم زیانگەیێنەر تا پەیامەکەی من بەنەسر بدات؟ وتی: بەڵێ ئەی سەروەری باوەڕداران، محەممەد کوڕی جەعفەری عامری. مەئمون منی بانگ کرد و فەرمانی پێدام پەیامەکەی بەنەسر بگەیێنم. نەسر لەم کاتەدا لەکەفەر عەزون لەسەروج بوو. پەیامەکەی مەئمونم پێگەیاند. نەسر ملکەچی خۆی نیشاندا بەو مەرجەی هەرگیز نەڕواتە بارەگای مەئمون. مەئمون بەمە رازی نەبوو و وتی: بۆ بەمشێوە لەدەست من هەڵدێت؟ وتم: لەبەر گوناحەکانی رابردووی خۆم. مەئمون وتی: ئایا گوناحەکانی ئەو گەورەتر لەفەزڵ کوڕی رەبیع و عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالیدە؟ فەزڵ، سوپاسالارەکان، سامان و کەرەستەکانی جەنگ و ئەوەی ڕەشید لەوەسیەت نامەکەی بۆ منی دانابوو، لەمنی سەند و پێشکەشی محەممەدی برامی کرد و بەتەنیا منی لەمەرو بەجێهێشت و بەئەندازەیەك دڵی براکەمی لەمن ڕەش کرد کەئەو پێشهاتانە روویدا کەبۆ من لەهەر پێشهاتێك دژوارتر و ناخۆشتر بوو. عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالید جێگرەکەی منی لەشاری خۆم و باوباپیرانم دەرپەڕاند و هەموو سامانەکانی منی تالان کرد، ماڵی وێران کرد و ئیبراهیمی وەك خەلیفە هێنایە سەرتەخت بەلام من هەردووکیانم بەخشی. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران! مۆڵەتی قسەم پێ بدە. وتی: قسە بکە. وتم: فەزڵ کوڕی رەبیع دەست پەروەردەی ئێوە و موالی ئێوە بوو، باوکانیشی بەهەمان شێوە، بارودۆخێکی بوو کەئەوی پەیوەستی ئێوە دەکرد، عیسا یەکێك لەپیاوانی خەلافەتەکەی تۆیە و رابردووی ئەو وەك رابردووی کەسانی دیکە روون و ئاشکرایە. بەلام نەسر هیچ هێزێکی نییە دڵی پێ خۆش بکات هاوشێوەی باوباپیرانی کەشوێنکەوتەی منداڵەکانی ئومەییە بوون.

مەئمون وتی: تۆ ڕاست دەکەیت بەڵام دەستی لێ هەڵناگرم تا ئەو کاتەی دێتە بارەگاکەم.

محەممەد کوڕی جەعفەر دەڵێت: نەسرم لەم پەیامە ئاگادار کردەوە. بانگی سوارەکانی کرد و بەخێرایی لەدەوری کۆبوونەوە، وتی: هاوار لەمەئمون، ئەو نەیتوانی بەسەر چوارسەد قریۆك (یانی خەڵکانی زەت) زاڵ ببێت و هەنووکە دەخوازێت بەسەر سوپای عەرەبەکان زاڵ ببێت؟ عەبدوڵڵە کوڕی تاهیر دوای ئەوەی لەملکەچ بوونی ئەو بێ هیوا بوو، جەنگی دەستپێکرد و بارودۆخی لێ دژوار کرد تا ئەوەی نەسر خوازیاری ئەمان بوو. عەبدوڵڵە ئەمانی پێبەخشی. ئەو لەئوردووگاکەی هاتەدەر و بەرەو لای عەبدوڵڵە لەڕەققە، ملی ڕێگەی گرتەبەر. گەمارۆ خستنە سەر نەسر و جەنگ دژی ئەو پێنج ساڵ درێژەی کێشا. کاتێك لەئوردووگاکەی هاتەدەر، عەبدوڵڵە، قەڵای کیسومی وێران و خاپور کرد. نەسری لەسەفەری ساڵی دووسەد و دە/ ٢٤/ ژوئەنی ٨٢٤ زایینی بۆ بارەگای مەئمون ڕەوانە کرد.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا مەئمون، عەلی کوڕی سەدەقە ناسراو بەناوی زورەیقی وەك فەرمانداری ئازەربایەجان و ئەرمەنستان دیاری کرد و فەرمانی جەنگ دژی بابەکی خورەمدینی پێدا. ئەو، ئەحمەد کوڕی جونەیدی ئیسکافی بۆ جەنگی بابەك ڕەوانە کرد بەڵام لەسەر دەستی بابەك ئەسیر کرا. مەئمون دوای ئەم ڕووداوە، ئیبراهیم کوڕی لەیس کوڕی فەزڵی وەك فەرمانڕەوای ئازەربایەجان دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا میخائیل کوڕی جۆرجیس پاشای ڕۆم کە بۆ ماوەی نۆ ساڵ فەرمانڕەوایەتی دەکرد، مرد و تۆفیلی کوڕی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت.

هەروەها لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی نوسەیر لەئەفریقیە نافەرمانی فەرمانی ئەمیر، زیادە اللەی کرد. ئاماژەمان بەم ڕووداوە لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی

ساڵی دووسەد و دوو/ ٨١٧ زاییندا.

لەم ساڵەدا باوکی عوبەیدە مەعمەر کوڕی موسەنای لوغەوی (وشەناس) کەدەستەیەك مەرگی ئەو بۆ ساڵی دووسەد و دە/ ٨٢٥ زایینی دگێڕنەوە، کۆچی دوایی کرد. ئەو شوێنکەوتەی باوەڕی خەواریج بوو. ساڵەکانی ژیانی نەوەد و سێ ساڵ درێژەی کێشا. دەڵێن: ئەو لەساڵی دووسەد و سیانزە/ ٨٢٨ زایینی لەتەمەنی نەوەد و هەشت ساڵی مرد.

لەم ساڵەدا یەعلی کوڕی عوبەیدی تەیالسی باوکی یوسف و فەزڵ کوڕی عەبدولحەمیدی موسڵی حەدیس بێژ، مردن.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و دەی كۆچی( ٨٢٥ زایینی )

## زاڵبوونی مەئمون بەسەر كوڕی عائیشە

لەم ساڵەدا مەئمون بەسەر ئیبراهیم كوڕی محەممەد كوڕی عەبدولوەهاب كوڕی ئیبراهیمی ئیمام ناسراو بەكوڕی عایئشە و محەممەد كوڕی ئیبراهیمی ئەفریقی و مالك كوڕی شاهی و هاوڕێیانی ئەوان كە بۆ وەرگرتنی بەیعەت لەگەڵ ئیبراهیم كوڕی مەهدی، هەوڵیان دەدا، سەركەوتن. قوترەبولی ئەو كەسە بوو پەردەی لەسەر نهێنییەكانی ئەوان لای مەئمون هەڵگرت. ئەوان بەڵێنیاندا بوو كاتێك بۆ جەنگ دژی نەسر كوڕی شەبەس بەرێكەون، پردەكە وێران دەكەن بەڵام عیمرانی قوترەبولی مەئمونی لەم پیلانە ئاگادار كردەوە و هەموویان لەمانگی سەفەر/ ٢٢ مەی ٨٢٥ زایینی قۆڵبەست كران. نەسر كوڕی شەبەس بێ ئەوەی كەسێك لەپیلانگێران سەردانی بكات، هاتە ناو بەغداد. كوڕی عائیشە دەستگیرا كرا و سێ ڕۆژ لەبەر هەتاوی سوتێنەر لەكەنار كۆشكەكەی مەئمون بەپێوە ڕایانگرت و دواتر قامچی باران و خستیانە زیندان.

مالك كوڕی شاهی و هاوڕێیانی ئەویان قامچی باران كرد و ئەوان بەناچاری ناوی هاودەستەكانی خۆیان بۆ مەئمون نووسی. مەئمون ئازاری لەو كەسانە نەدا و وتی: دڵنیا نیم لەوەی ئەوان ناوی دەستەیەك تاوانباریان نووسیبێت. دواتر ئەو خوێنی كوڕی عائیشە و كوڕی شاهی و دوان لەهاوڕێیانی ئەوانی ڕشت. هۆكاری مەئمون لەكوشتنیان ئەوە بوو ئاگاداریان كردەوە لەوەی دەیانەوێت لەناو زیندانەكەوە تونێلێك لێ بدەن و خۆیان دەرباز بكەن. ئەوان ڕۆژێك پێشتر دەرگای زیندانیان لەسەر خۆیان داخستبوو و ڕێگەیان نەدەدا كەس بڕواتە لایان. كاتێك مەئمون ئاگادار بوویەوە، سوار ئەسپەكەی بوو و سەری ئەوانی لەجەستە جیا كردەوە و كوڕی عایشەی لەچوارمێخەدا. ئەو یەكەم كەس لەمناڵەكانی عەباس بوو لەئیسلامدا لەچوارمێخەدرا. جەنازەكەیان داگرت، كفنیان كرد و نوێژیان لەسەر خوێند و لەگۆڕستانی قوڕەیش بەخاكیان سپارد.

## گرتنی ئیبراهیم کوڕی مەهدی

لەرەبیع الاوەلی ئەم ساڵە/ ٢٤ ژوئەنی ٨٢٥ زایینی، ئیبراهیم کوڕی مەهدی (کەبۆ ماوەی یەك ساڵ خەلیفە بوو) گیرا. ئەو لەگەڵ دوو ژنی دیکە جل و بەرگی ژنانەی لەبەر کردبوو، لەکاتی شەو پاسەوانێکی رەش لێی پرسی: لەکوێوە دێن و لەم کاتەدا چی دەکەن؟ ئیبراهیم ئەنگوستیلە یاقوتەکە گرانباییەکەی خۆی پێدا تا رێگەیان بۆ بکاتەوە و پرسیاریان لێ نەکات. کاتێك پاسەوان چاوی بەئەنگوستیلەکە کەوت، گومانی زیادی کرد و بەخۆی وت: ئەمە ئەنگوستیلەی پیاوێکی رێزدارە. ئەوانی بۆ لای فەرماندەکەی برد. فەرمانی پێدان رووبەند لەروخسار هەڵگرن. ئیبراهیم ئەو کارەی نەکرد. فەرماندەی دەمامەکەی لابرد و ریشی ئیبراهیمی بینی. ئەویان بەفەرماندەی پردەکە سپارد. فەرماندەی پردەکە ئەوی ناسییەوە و رەوانەی بارەگای مەئمونی کرد و مەئمونیان لەگرتنی ئەو ئاگادار کردەوە. مەئمون فەرمانیدا تا بەرەبەیان بیهێڵنەوە. بۆ بەیانی ئیبراهیمیان لەبارەگای مەئمون دانیشاند و ئەو رووبەندی روخساری پێ داپۆشیبوو، لەدەوری ملی ئاڵاندیان و سەرپۆشێکیان خستە سەر سینەی تا منداڵەکانی هاشم بزانن لەچ دۆخێکدا ئەویان دەستگیر کردووە. دواتر ئەویان بۆ لای ئەحمەد کوڕی باوکی خالید نارد. ئەو، ئیبراهیمی لەزیندانەکەی خۆی، زیندانی کرد. کاتێك مەئمون بۆ بینینی حەسەن کوڕی سەهل رێگەی واسنی گرتەبەر، ئەوی لەگەڵ خۆی برد و حەسەن یا بەگومانێك پورانی کچی، نێوەنجیگەرییان بۆ ئیبراهیم کرد.

دەڵێن: کاتێك ئیبراهیمیان قۆڵبەست کرد، بردیانە ماڵەکەی باوکی ئیسحاق، موعتەسەم. موعتەسەم ئەوی سوار ئەسپ لەپشت سەری فەروحی تورکی (یەکێك لەکۆیلەکان) دانیشاند. کاتێك گەیشتنە لای مەئمون، مەئمون وتی: ئیبراهیمی بەدبەخت. ئیبراهیم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خاوەنی تۆڵە، دەتوانێت تۆڵەی خۆی بستێنێت بەڵام بەخشین لەخواپەرەستییەوە نزیکترە. هەرکەس بەئامرازەکانی بەدبەختی دڵ ببەستێت، رووداوەکانی رۆژگار لەخۆی نزیك دەکاتەوە. خواوەند تۆی پێش هەموو بەندەکان خستووە و هەموو گوناحکارەکانی خستۆتە ژێر دەستی تۆ، ئەگەر سزام بدەیت، ماڤی خۆت بەجێهێناوە و ئەگەر

بمبەخشیت، گەورەیی خۆتە.

مەئمون وتی: لەتۆ خۆش دەبم ئەی ئیبراهیم. ئیبراهیم ناوی خوای هێنایە سەرزمان و سەری لەخاك سوو. دەڵێن: ئەو كاتەی ئیبراهیم خۆی حەشاردابوو، ئەم هۆنراوەی بۆ مەئمون نووسی. مەئمون لەپاڵ نامەكەی ئەو نووسی: هێز، تۆڵەسەندنەوە لەناو دەبات و پەشیمانی هەمان گەڕانەوە لەگوناحە و لەنێوان ئەم دوو بەخشینە، خواوەندە كەگەورەترین خواستی ئێمەیە. ئیبراهیم بۆ وەسفی مەئمون وتی:

| | |
|---|---|
| يا خير من ذملت يمانية به | بعد النبى لايس او طامع |
| و ابر من عبد الاله على التقى | غيبا و اقوله بحق صادع |
| عسل الفوارع ما اطعت فان تهج | فالصاب يمزج بالسمام الناقع |
| متيقظا حذرا و ما تخشى العدى | نبهان من و سنات ليل الهاجع |
| ملئت قلوب الناس منك مخافة | و تبيت تكلوهم بقلب خاشع |
| بأبى و امى فدية و أبيهما | من كل معضلة و ذنب واقع |
| ما ألين الكنف الذى بوأنتى | وطنا و امرع ربعه للراتع |
| للصالحات أخا جعلت و للتقى | و أبا روفا للفقير القانع |
| نفسى فداؤك اذ تضل معازرى | و الوذ منك بفضل حلم واسع |
| املا لفضلك و الفواضل شيمة | رفعت بناءك للمحل اليافع |
| فبذلت افضل ما يضيق ببذله | وسع النفوس من الفعال البارع |
| و عفوت عمن لم يكن عن مثله | عفو و لم يشفع اليك بشافع |
| الا العلو عن العقوبة بعد ما | ظفرت يداك بمستكين خاضع |
| فرحمت اطفالا كأفراخ القطا | و عويل عانسة كقوس النازع |
| و عطفت لآصرة على كما و هى | بعد انهياض الوثى عظم الظالع |
| الله يعلم ما اقول كأنها | جهد الالية من حنيف راكع |
| ما ان عصيتك و الغواة تقودنى | اسبابها الا بنية طائع |
| حتى اذا علقت حبائل شقوتى | بردى الى حفر المهالك هائع |
| لم ادر ان لمثل جرمى غافرا | فوقفت أنظر اى حتف صارعى |

رد الحياة على بعد ذهابها    ورع الامام القادر المتواضع
أحياك من و لاك افضل مدة    ورمى عدوك فى الوتين بقاطع
كم من يد لك لم تحدضنى بها    نفسى اذا آلت الى مطامعى
اسديتها عفوا الى منينة    و شكرت مصطنعا لاكرم صانع
الا يسيرا عند ما اوليتنى    و هو الكبير لدى غير الضائع
ان انت جدت بها على تكن لها    اهلا و ان تمنع فاكرم مانع
ان الذى قسم الخلافة حازها    من صلب ادم للامام السابع
جمع القلوب عليك جامع امرها    و حوى رداؤك كل خير جامع

**واتاکەی: ئەی ئەو کەسەی دوای پێغەمبەر(د.خ) باشترین کەسیت کەوشتری یەمانی بۆ هیوادار و بێ هیوا بەرێگەدا دەبیات، و باشترین کەسی کەبۆ خواپەرەستی، خوای پەرەستیوە و راستییەکان باشتر لەهەمووان ئاشکراتر دەکات. تا ئەو کاتەی گوێرایەڵی فەرمانت بن. هەنگوینی کوێستانی بڵندی و ئەگەر نافەرمانی بکەن، تاڵ دەبیت و لەگەڵ ژەهری گیانبڕ تێکەڵ دەبیت، بێداریت و وشیاریت و لەدەستدرێژی ترست نییە و لەباوێشکدانی شەوانە بەدووریت، دڵی ئەو کەسانەی لەترسی تۆ لێوانلێوە و تۆ بەچاوی نیگەران شەو بەپاسەوانی کردنی ئەوان بەسەر دەبەیت لەبەرابەر هەر پێشهاتێك و رووداوێك، دایك و باوکم و منداڵەکانیان بەقوربانی تۆ بن، ئەو پەناگەی کردتە جێگەی من، خۆش بوو و بۆ ئاژەڵەکان باشترین لەوەڕگە، بۆ کارە چاکەکان و خۆپارێزی باشترین داوەری و بۆ هەژاری قەناعەت پیشە، باوکێکی مێهرەبان، گیانم بەقوربانت بێت کاتێك دەرفەتی لێبوردنم نەما، پەنا بۆ خۆڕاگری بەرفراوانی تۆ دەبەم و چاوەڕوانی بەخشینی تۆ دەکەم چوونکە رێزدارێکی تایبەتمەندییەکە پێگەی تۆی بۆ بەرزترین پێگە بەرز کردۆتەوە. ئەوەی گیانەکان لەدانی درێغی دەکەن، تۆ دەیدەیت و بەکەسێك دەبەخشیت کەشیاوی بەخشین نییە و رێگەی بۆ بارەگاکەی تۆ نییە. ئەو کاتەی دەستت بەسەر ناتەوانێکدا گرت، لەسزادانی چاوت پۆشی و بەزەییت بەمنداڵەکان کەهاوشێوەی جوجکەی وشترمل و ناڵەی ژنێکی داماو هاتەوە. خواوەند دەزانێت چی دەڵێم چوونکە ئەمە سوێندی کەسێکی ملکەچ و گوێرایەڵە. ئەو کاتەی**

گومڕاکان منیان بۆ نافەرمانی تۆ هاندا و نافەرمانیم کرد، مەبەستی فەرمانبەریم بوو تا ئەوەی تەناف بەدبەختی من بەشوێنێکەوە هەڵواسرا کەگێژاوی لەناچوون دەگەیشت، نەمزانی هاوشێوەی گوناحی من بەخشندەیەك هەیە و دەمڕوانی کەچۆن مەرگ من لەناو دەبات؟ بەلاّم خۆپارێزی پێشەوای لەخۆبوردوو ژیانی بۆ گەڕاندمەوە دوای ئەوەی لەدەستم ڕۆشت. ئەو کەسەی خەلافەتی بەتۆ بەخشی، هیوادارم بۆ ماوەیەك درێژ بەزیندووی بتهێڵێتەوە و رێگەنەدات دوژمنەکانت سەر بەرز بکەنەوە. منەتی زۆرت خستە سەرم و سپاسم دەکردی بەلاّم ئەو کاتەی تەماح بەسەر مندا زاڵ بوو، بیری چاکەکانی تۆ نەکەوتمەوە مەگەر بەئەندازەیەکی کەم بەلاّم زۆرە و جەنگ، شیاوی لەبیر کردن نییە. ئەگەر دووبارە بمبەخشیت، شیاوی بۆ ئەو کارە و ئەگەر نەمبەخشیت، رێزدارترینی رێزدارانیت. ئەو کەسەی خەلافەتی لەپشتی مناڵەکانی ئادەم دابەش کرد، تایبەتی کرد بەحەوتەمین پێشەوا.

دەڵێن: کاتێك مەئمون ئەم هۆنراوەی بیست، وتی: ئەوە دەڵێم کەیوسف بەبراکانی وت: ئەمرۆ رۆژی سەرکۆنە کردنی ئێوە نییە؛ خواوەند دەتانبەخشێت و ئەو بەخشندەترینی بەخشندەکانە.

## پەیوەندی هاوسەرگیری مەئمون لەگەڵ پوران

لەرمەزانی ئەم ساڵە/ ١٥ دیسامبەری ٨٢٥ زایینی،مەئمون، پوران کچی حەسەن کوڕی سەهلی وەك هاوسەر هەڵبژارد. مەئمون لەبەغدادەوە بەرەو فەم ئەلسولاّح، لەشکرگەی حەسەن کوڕی سەهل بەرێکەوتبوو، لەم شوێنە بووك و زاوا بەیەك گەیشتن. کاتێك مەئمون ڕۆشتە ناو پەردە، حەمدونە کچی ڕەشید و دایکی جەعفەر زوبەیدە دایکی ئەمین و دایەگەورەی پوران دایکی فەزڵ و حەسەم کوڕی سەهل لای پوران دانیشتبوون.

کاتێك مەئمون هاتە ناو، دایکی حەسەن کوڕی سەهل هەزار دانە مرواری گرانبایی بەسەردا پرژاند. مەئمون فەرمانیدا مرواریيەکان کۆبکەنەوە و هەموویانی بەپوران بەخشی و وتی: هەرچی دەخوازی داوا بکە. بووك وەلاّمی نەدایەوە. دایکی حەسەن کوڕی سەهل وتی: ئەوەی لەدڵتایە، بەسەروەری باوەڕدارانی بڵێ، خۆی

فەرمانی بەتۆ داوە. پوران داوای لەمەئموون کرد ئیبراهیم کوڕی مەهدی ببەخشێت. مەئموون وتی: پێشتر ئەوکارەم کردووە. پوران داوای لەمەئموون کرد بەدایکی جەعفەر (دایکی ئەمین خەلیفەی لەسەر کار لابراو) مۆڵەتی ڕۆشتن بۆ ماڵی خوا بدات. مەئموون مولەتی پێدا. لەم کاتەدا دایکی جەعفەر جل و بەرگی بەمرواری دووراوی ئومەوی (لەوان تالان کرابوو) بەپوران بەخشی. مەئموون لەهەمان شەو کچێنی پورانی پرژاند. لەو شەوەدا مۆمێك هەڵگیرسا کەچل مەن عەنبەری تیا بەکار برابوو.

مەئموون حەڤدە رۆژ لای حەسەن مایەوە. لەم ماوەدا هەموو کەرەستەکانی میوانداری ئەوان ئامادە بوو. حەسەن بەسوپاسالارەکانی خۆی بەپێی پێگە و جێگەیان پاداشت و دیاری بەخشی. کۆی گشتی دیارییەکان گەیشتە پەنجا هەزار هەزار درهەم. حەسەن ناو و نیشانی پارچە زەوییەکانی خۆی بەجیاجیا نووسی و بەسەر سوپاسالارەکان دابەشی کرد. ناوی هەر پارچە زەوییەك بەر هەرکەسێك دەکەوت، دەبووە خاوەنی ئەو زەوییە.

## لەشکرکێشی عەبدواللە کوڕی تاهیر بۆ میسر

لەم ساڵەدا عەبدواللە کوڕی تاهیر ڕێگەی میسری گرتەبەر و دەستی بەسەردا گرت. لەکۆتایی ئەم لەشکرکێشییە، عوبەیدالله کوڕی سەری داوای ئەمانی کرد.

هۆکاری ئەم هێرشە ئەوە بوو عوبەیدالله میسری خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و گوێڕایەڵی فەرمانەکان نەبوو. دەستەیەك لەئاندۆلۆسییەکان ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەستیان بەسەر ئەسکەندەرییەدا گرت. عەبدواللە کوڕی تاهیر سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ نەسر کوڕی شەبەس بوو، کاتێك شکستی بەنەسر هێنا، ڕووی کردە میسر. کاتێك لەو سەرزەمینە نزیك کەوتەوە، یەکێك لەفەرماندەکانی خۆی ڕەوانە کرد تا شوێنێك بۆ ئوردوو لیدان بدۆزێتەوە. کوڕی سەری بەدەوری میسردا خەندەکی هەڵکەندبوو. ئاگاداریان کردەوە کەفەرماندەیەك لەسوپاکەی نزیك بۆتەوە. عوبەیدالله لەگەڵ چەند لەهاوەڵانی بەرێکەوت و خۆی ڕووبەڕووی ئەو فەرماندەیە بوویەوە. هەردووك دەستیان بۆ شمشێر برد و شەڕێکی قورس

لەنێوانیاندا هەڵگیرسا. ژمارەی سەربازەکانی ئەم فەرماندەیە کەم بوو بەڵام توانی هەستیان ببزوێنێت. کەسێکی بۆ لای عەبدوڵڵە کوڕی تاهیر نارد و ئاگاداری کردەوە. عەبدوڵڵە سەربازەکانی سوار ئێستر کرد و ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا دەبرد بۆ ئەوەی هیلاك نەبن. نێردراوەکان بەخێرایی خۆیان گەیاند. هێشتا عوبەیدالله و فەرماندەکە سەرقاڵی جەنگ بوون. عوبەیدالله کاتێك ئەم بارودۆخەی بینی، زانی ناتوانێت خۆڕاگری بکات و هەڵات. زۆربەی سوپاکەی کەوتنە ناو خەندەکەکە. ژمارەی ئەو کەسانەی کەوتنە ناو خەندەکەکە و گیانیاندا زیاتر لەژمارەی ئەوکەسانە بوو بەشمشێر کوژران.

کوڕی سەری هاتە میسر و دەروازەکانی بەرووی عەبدوڵڵە و سوپاکەی بەست. عەبدوڵڵە گەمارۆی خستە سەر و چیتر نەیتوانی بێتەدەر. کوڕی سەری هەزار کۆیلە و کەنیز کەهەرکام هەڵگری هەزار دینار بوو، لەشەوێکدا بۆ لای عەبدوڵڵە کوڕی تاهیری ڕەوانە کرد. عەبدوڵڵە کوڕی تاهیر ئەوانی گەڕاندەوە و نووسی: ئەگەر لەرۆژدا بەدیاریەکەی تۆ رازی دەبووم، لەشەودا نەمدەگەڕاندەوە.

لەم کاتەدا کوڕی سەری داوای ئەمانی کرد. دەڵێن ئەم پێشهاتە لەساڵی دووسەدو یانزە/ ٨٢٦ روویداوە.

ئەحمەد کوڕی حەفس کوڕی باوکی شەماس دەڵێت: لەگەڵ عەبدوڵڵە کوڕی تاهیر بەرەو میسر دەڕۆشتین، لەنێوان رەملە و دیمەشق پیرەپیاوێکی سارانشینمان سوار لەسەر وشتر بینی. سڵاوی لێکردین و وەڵاممان دایەوە. باوکی شەماس دەڵێت: من و ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی رافقی و ئیسحاق کوڕی باوکی رێبعی کەهاورێیەتی عەبدوڵڵەمان دەکرد، جل و بەرگەکانمان لەو جوانتر و گرانباییتر بوو. پیرەپیاو سەیری روخساری ئێمەی کرد. پێم وت: پیرەپیاو، کاتێکی زۆرە سەیرمان دەکەیت، لەوەی پێشتر نەتدەزانی، دڵنیا بوویت؟ وتی: سوێند بەخوا هیچ کام لەئێوەم پێشتر بەمشێوە نەبینیوە بەڵام پیاوێکی ئاساییم کەبەهرەیەکی تایبەتم پێبراوە. باوکی شەماس دەڵێت: ئیشارەم بۆ ئیسحاق کوڕی رێبعی کرد و وتم: سەبارەت بەو چی دەڵێیت؟ وتی:

أری کاتبا داهی الکتابة بین          علیه و تأدیب العراق منیر

له حركات قد يشاهدان انه          عليم بتقسيط الخراج بصير

واتاكەی:دەبیرێك كەشارەزایی ئەو لەنوسینەكانی دیارە. ئەو بەشێوەیەك دەبینم كەفێركاری عێراق بۆ ئەو روون و ئاشكرایە. جووڵەكانی ئەو شایەتی دەدەن كە ئەو لەدابەش كردن و رێكخستنی كاروباری باج ئاگادارە.

دواتر سەیری ئیسحاق كوڕی ئیبراهیمی رافیقی كرد و وتی:

و مظهر نسك ما عليه ضميرة          يحب الهدايا بالرجال مكور

اخال به جبنا و بخلا و شيمة          تخبر عنه انه لوزير

واتاكەی: ئەو بەشێوەیەك خۆپارێزی نیشان دەدات كە لەناخەوە بەو شێوە نییە و حەز دەكات بەردەوام دیاری بۆ ببەن. گومان دەكەم ئەم ریسوایی و پەستییە ئەو شێوەیە كەشایەتی دەدات ئەو وەزیرە.

دواتر سەیری منی كرد و وتی:

و هذا نديم للامير و مؤنس          يكون له بالقرب منه سرور

و أحسبه للشعر و العلم راويا          فبعض نديم مرة و سمير

واتاكەی: ئەمە هاودەم و هاونشینی ئەمیرە و لەنزیكی لەئەمیر شادمانە (یا ئەمیر لەنزیكی ئەو شادمانە) ئەو هۆنراوە و زانست دەگێڕێتەوە. ئەو هەندێ كات هاونشینە و هەندێ كات هاودەمی شەوانەی ئەمیر.

لەم كاتەدا سەیری ئەمیری كرد و وتی:

و هذا الامير المرتجى سيب كفه          فما ان له فى العالمين نظير

عليه رداء من جمال و هيبة          و وجه بادراك المجاح بشير

لقد عظم الاسلام منه بذى يد          فقد عاش معروف و مات نكير

الا انما عبد الاله ابن طاهر          لنا والد بر بنا و امير

واتاكەی: ئەمەیە ئەو ئەمیرەی چاوەڕوانی بەخششی لێدەكرێت و لەجیهان هاوتای نییە. ئەو جل و بەرگێكی جوانی لەبەر كردووە و روخساری مژدەی رزگاری لێ دەبارێت. ئیسلام بەهۆی ئەوەوە گەشەی سەند، چاكەكاری زیندو بوویەوە و خراپەكاری مرد. بەندەی خواوەند، عەبدوللە و كوڕی تاهیر بۆ ئێمە باوكێكی مێهرەبان و فەرماندارە.

باوکی شەماس دەڵێت: ئەم ڕووداوە کاریگەری زۆری لەسەر عەبدوڵڵە بەجێهێشت و واق وڕماوی کرد. فەرمانیدا پێنسەد دیناری پێ ببەخشن و لەخۆی نزیکی کردەوە.

## گرتنی ئەسکەندەرییە لەسەر دەستی عەبدوڵڵە

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە، ئەو ئاندۆلۆسییانەی بەسەر ئەسکەندەرییەدا زاڵ بوون، دەریەڕاند و ئەمانی پێ بەخشین. ئەوان سوپایەك بوون بەکەشتی لەئاندۆلۆسەوە هاتبوون و خەڵکان لەم کاتەدا سەرقاڵی شۆڕشەکەی کوڕی سەری و کەسانی دیکە بوون. کەشتییەکانی ئەوان لەئەسکەندەرییە لەنگەریان خست. جڵەوداری ئەوان بەباوکی حەفس ناودەبرا. ئەم سوپایە لەئەسکەندەرییە مایەوە تا عەبدوڵڵە کوڕی تاهیر هاتە ئەو شارە. عەبدوڵڵە ئاڵای جەنگی هەڵکرد کەئەگەر ملکەچی فەرمانەکان نەبن، خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن. ئەوان بەداواکەی عەبدوڵڵە ڕازی بوون و داوایان لێکرد ئەمانیان پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی ڕوو بکەنە کەنارەکانی ڕۆم لەدەرەوەی سنوورەکانی خەلافەتی ئیسلامی. عەبدوڵڵە بەم مەرجە ڕازی بوو. ئەوان ڕۆشتن و لەدورگەی ئەقریتش دابەزین و ئەو سەرزەمینەیان بۆ ژیان هەڵبژارد و مانەوە و تۆوی خۆیان بڵاو کردەوە.

یونس کوڕی عەبدولعەلی دەڵێت: گەنجێك لەڕۆژهەڵاتەوە هات (مەبەستی عەبدوڵڵەیە) لەکاتێکدا جیهان لێوانلێو بوو لەئاژاوە و هەرکام لەبەشەکانی سەرزەمینی ئێمە لەژێر دەستی تاقمێکدا بوو تا ئەوەی ژیانی ئێمەی ڕێکخست و ئاسودەیی بەبێ تاوانەکان بەخشی و هاوولاّتیان ملکەچی فەرمانەکانی بوون.

## لەسەر کار لابردنی خەلیفە لەلایەن خەڵکانی قوم

لەم ساڵەدا خەڵکانی قوم، مەئمونیان لەخەلافەت لابرد. هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو کاتێك مەئمون لەخوراسانەوە ڕێگەی عێراقی گرتەبەر، چەند ڕۆژێك لەڕەی مایەوە و کەمێك لەباجی سەر شانی ئەوانی سوك کرد. خەڵکانی قوم چاوەڕوانی کەم کردنەوەی باج لەلایەن مەئمونەوە بوون. نامەیەکیان بۆ نووسی و داوایان

لێکرد باجی سەرشانیان کەم بکاتەوە. باجی ئەوان دوو هەزار درهەم بوو. مەئمون بەداواکەیان رازی نەبوو و ئەوان بەدانی باج رازی نەبوون. مەئمون، عەلی کوڕی هوشام و عوجەیف کوڕی عەنبەسەی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەو دووانە بەسەر خەڵکانی قومدا زاڵبوون. لەم ناوەدا یەحیا کوڕی عیمران کوژرا و دیواری شارەکە وێران و حەوت هەزار درهەم باجیان لێ وەرگرتن دوای ئەوەی سکالاّیان لەباجی دوو هەزار درهەم دەکرد.

## ڕووداوەکانی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم سوپایەکی گەورەی بۆ سەرزەمینی فەرەنگەکان ڕەوانە کرد و عوبەیدالله ناسراو بەبەلەنسی وەك فەرمانده‌ی ئەوان هەڵبژارد. ئەوان گەشتنە سەرزەمینی دوژمن، ڕفاندیان، کوشتیان، تالاّنیان کرد، خوێنیان ڕشت و ئەسیریان گرت.ئەوان لەرەبیع الاوەلی ئەم ساڵە/ ٢٤ ژوئەنی ٨٢٥ زایینی ڕووبەرووی دوژمن بوونەوە و دوای جەنگێکی گیانبڕ ناباوەڕان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زوریان لێ کوژرا.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان دوبارە سوپایەکی گەورەی بۆ هێرش کردنە سەر دوژمن ڕەوانە کرد و دەستی بەسەر قەلاّیەکی ئەواندا گرت و لەنیوەی رەمەزان/ ٣٠ دێسامبری ٨٢٥ زایینی کەرەستەی جەنگی زۆری بەتالاّنی دەستکەوت.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان فەرمانیدا لەجەییان مزگەوتی گەورە دروست بکەن.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان چەندین دەستەی جەنگاوەری لەباوکی شەماخ محەممەد کوڕی ئیبراهیم، گەورەی یەمانییەکانی تەدمیر وەرگرت تا شۆرشی نێوان موزێرییەکان و یەمانییەکان دامرکێتەوە بەلاّم کەسیان پاشەکشێی نەکرد و شۆڕش بەردەوام بوو. کاتێك عەبدولرەحمان بارودۆخی بەمشێوە بینی، فەرمانی بەکارگوزارەکەی خۆی لەتەدمیردا ئەو شارە بەجێبێڵێت و مورسیە وەك شوێنی مانەوەی هێزەکانی هەڵبژێرێت (تا شارەکە چۆڵ ببێت و هەردوولا دەست لەجەنگ هەڵبگرن). کارگوزار ئەم کارەی کرد. مورسیە لەو ڕۆژگارەدا ناوەندی ئەم

سەرزەمینە بوو. ئەم شۆڕشە تا ساڵی ٢١٣/ ٨٢٨ زایینی درێژەی کێشا و دواتر عەبدولرەحمان سوپایەکی ڕەوانە کرد و باوکی شەماخ ملکەچی فەرمانەکانی بوو و ڕۆشتە بارەگاکەی و بوو بەیەکێك لەسوپاسالارەکان و کەسانی نزیکی عەبدولرەحمان. بەم شێوەیە شۆڕش لەو سەرزەمینە کۆتایی پێهات.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا شەهریار کوڕی شەروین، پاشای کوێستانەکانی تەبەرستان مرد و شاپوری کوڕی جێگەی گرتەوە. مازیار کوڕی قارن جەنگ دژی ئەوی دەستپێکرد و ئەسیری کرد و کوشتی و تەبەرستان کەوتە ژێر دەستی مازیار.

لەم ساڵەدا سەباح کوڕی عەباس کوڕی محەممەد فەرمانداری مەککە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عولیە کچی مەهدی کە لەساڵی ١٦٠ کۆچی/ ٧٧٦ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا، کۆچی دوایی کرد. هاوسەرەکەی موسا کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و یانزەی کۆچی ( ٨٢٦ زایینی )

لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی سەریان هێنایە بەغداد و لەشاری مەنسور، نیشتەجێیان کرد. لەم کاتەدا عەبدوالله کوڕی تاهیر فەرمانڕەوایەتی میسر، شام وجەزیرەی دەکرد. دەستەیەك لەخزمەکانی مەئمون پێیان وت: عەبدوالله کوڕی تاهیر شوێنکەوتەی منداڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە و باوکیشی پێشتر شوێنکەوتەی ئەوان بووە. مەئمون بەم وتانە رازی نەبوو بەڵام دووبارە براکەی قسەی بۆ کرد. مەئمون پیاوێکی راسپارد و پێی وت: وەك کەسێکی خۆپارێز و چاکەکار بڕۆ میسر و دەستەیەك لەگەورەکانی ئەو شارە بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵ قاسم کوڕی ئیبراهیم کوڕی تەباتەبا هان بدە، دواتر بڕۆ لای عەبدوالله کوڕی تاهیر و پێشنیار بەویش بکە، وەسفی قاسمی بۆ بکە و بەردەوام بۆ ئەو کارە هانی بدە و قسەی دڵی ببیستە و منی لێ ئاگادار بکەرەوە.

ئەو پیاوە ئەو کارەی کرد و دەستەیەك لەکەسە ناسراوەکان پەیوەستی بوون. ئەوە لای ماڵی عەبدوالله کوڕی تاهیر دانیشت. کاتێك عەبدوالله مەبەستی سوار بوونی ئەسپەکەی کرد، نامەیەکی پێدا. کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی، بانگی کرد و پێی وت: نامەکەتم خوێندەوە، مەبەستت چییە؟ پیاو وتی: ئەمانم پێ دەدەیت؟ عەبدوالله وتی: بەڵێ. پیاو پێشنیاری خەلافەتی قاسمی پێکرد و باسی تایبەتمەندی و چاکەکاری ئەوی هێنایە ئاراوە.

عەبدوالله وتی: دادپەروەری دەکەیتە پیشە؟ پیاو وتی: بەڵێ. عەبدوالله وتی: ئایا بەندەکان نابێت سپاسی خواوەند بکەن؟ پیاو وتی: راستە. عەبدوالله وتی: تۆ کاتێك هاتیتە لای من کەمۆر وفەرمانی من لەرۆژهەلات و رۆژئاوا کاری پێدەکرێت و کەس ناتوانێت لەسنوری من نافەرمانی بکاتە پیشە. سەیری چەپ و راست و پێش و دواوەی خۆم دەکەم و جگە لەسپاس کردنی ئەو نیعمەتانەی خواوەند بەمنی بەخشیوە و ئەنجامدانی ئەرکەکانم، هیچی دیکە نابینم، هەنووکە پێشنیارم پێدەکەیت لەبەرابەر ئەم هەموو پێگە و نیعمەتە، نافەرمانی بکەمە پیشە و هانم دەدەیت بۆ کەسێك کە بۆ ئەم نیعمەتە لەهەموان شیاوترە، ڕێگەی فرت و فێڵ و

کوشتی بەکار ببەم. ئایا گومان دەکەیت ئەگەر ئاشکرا پێشنیاری بەهشتەم پێ بکەیت، خواوەند بەم فرت و فێڵە رازی دەبێت؟ خواوەند رازی دەبێت رێگەی ناسپاسی بگرمەبەر و پەیمان بشکێنم؟

پیاوەکە بێدەنگ بوو. عەبدوڵلە پێی وت: تەنیا بۆ گیانی تۆ دەترسم. لەم شارە برۆ چوونکە ئەگەر خەلیفە ئاگادار ببێتەوە، هەم خۆت بەکوشتت دەدەیت، هەم کەسانی دیکە.

کاتێك ئەو پیاوە لەوەفاداری عەبدوڵلە دڵنیا بوو، گەڕایەوە بۆ بارەگای مەئمون و ئەوی لەڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. مەئمون شادمان بوو و وتی: ئەو نەمامی دەستی خۆم و دەست پەروەردەی من و هاونەژادی منە. ئەو ئەم نهێنییەی ئاشکرا نەکرد و عەبدوڵلە کوڕی تاهیر تاکاتی مەرگی مەئمون ئاگادار نەبوویەوە. هۆکاری ئەم بەدگومانییە موعتەسەمی برای مەئمون بوو چوونکە لەعەبدوڵلە ڕەشبین بوو.

## کوژرانی سەیید کوڕی ئەنس

لەم ساڵەدا سەیید کوڕی ئەنسی ئەزدی فەرمانڕەوای موسڵ کوژرا. چۆنیەتی کوژرانەکەی ئەوە بوو زورەیق کوڕی عەلی کوڕی سەدەقەی ئەزدی موسڵی دەستی بەسەر کوێستانەکانی نێوان موسڵ و ئازەربایەجان گرت و لەنێوان ئەو و سەیید ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. لەم ساڵەدا زورەیق سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە. دەستەیەك ژمارەی سوپاکەی بەچل هەزار کەس دەزانن. ئەم سوپایەی بۆ جەنگی سەیید ڕەوانەی موسڵ کرد. سەیید لەگەڵ چوار هەزار سەرباز ڕووبەڕووی بوویەوە. هەر دوو سوپا لەسەوق الاحد[٦]، دەستیان بۆ شمشێر برد

کاتێك سەیید سوپاکەی بینی، خۆی هێرشی کردە سەریان. سەیید عادەتی بوو هەمیشە بەتەنیا هێرشی دەبرد. پیاوێك لەسوپاکەی زورەیق ڕووبەڕووی بوویەوە و شمشێریان دەرهێنا و یەکتریان کوشت و بەمشێوەیە خوێنی کەسی دیکە نەڕژا. ئەم پیاوە سوێندی خواردبوو ئەگەر سەیید ببینێت و نەیکوژێت یا خۆی نەکوژرێت، تەڵاقی ژنەکەی بکەوێت. ئەو ساڵانە سەد هەزار درهەمی لەزورەیق

---

[٦] ئەگەری هەیە یەکشەممە بازار بێت. وەرگێر

وەردەگرت. پێیان وت: بۆ ئەم پارەیە وەردەگریت؟ وتی: چوونکە ئەگەر سەیید ببینم، خوێنی دەرێژم. ئەو بۆ ئەم مەبەستە سوێندی خوارد و سوێندەکەی هێنایەدی.

کاتێك مەئمون لەکوژرانی سەیید ئاگادار بوویەوە، تورە بوو و محەممەد کوری حومەیدی توسی بۆ جەنگی زورەیق و بابەکی خورەمدین رەوانە کرد و فەرمانرەوایەتی موسڵی پێ سپارد.

## ناسازگاری لەنێوان عامر و مەنسور و کوژرانی مەنسور لەئەفریقییە

لەم ساڵەدا لەنێوان عامر کوری نافیع و مەنسور کوری نەسر لەئەفریقییە ناسازگاری هاتە ئاراوە. بنەمای ئەم ناسازگارییە لەوێوە سەرچاوەی گرت کە مەنسور رژدی بەعامر دەبرد. عامر سوپاکەی خۆی لەتونسەوە بۆ جەنگی مەنسور لەکۆشکی تونبەزە رەوانە کرد و گەمارۆی خستەسەر تا ئەو جێگەی ئاوی خواردنەوەی مەنسور و سوپاکەی کۆتایی هات. مەنسور نامەیەکی بۆ عامر نووسی و داوای ئەمانی کرد تا بەکەشتی بەرەو رۆژهەڵات بروات. عامر رازی بوو. مەنسور لەتاریکی شەو و بەنهێنی رێگەی ئەریسی گرتەبەر. کاتێك بەیانی بوویەوە و عامر هیچ نیشانەیەکی لەمەنسور نەبینی، شوێنی کەوت و دۆزییەوە. هەردوولا دەستیان بۆ شمشێر برد تا ئەوەی مەنسور هەڵات و رۆشتە ئەریس و لەوێ سەنگەری گرت. عامر دەوری شارەکەی گرت و کەشکەنجیرەکانی هەڵبەست.

کاتێك بارودۆخی ژیانی خەڵکانی ئەریس دژوار بوو، بەمەنسوریان وت: یا لەشارەکە دەرۆیت یا تەسلیم بەعامرت دەکەین، ئەم گەمارۆیە ژیانی لەئێمە دژوار کردووە. مەنسور داوای کاتی کرد تا کاروبارەکانی رێکبخات. مۆڵەت و کاتیان پێدا. مەنسور کەسێکی بۆ لای عەبدولسەلام کوری موفەرەج لەسەرکردەکانی سوپاکەی عامر نارد و پێشنیاری گفتوگۆی پێکرد. عەبدولسەلام هات و مەنسور لەسەرەوەی دیوارەکە قسەی لەگەڵ کرد، داوای بەخشینی بۆ کارەکانی خۆی کرد و داوای لێکرد ئەمانی لەعامر بۆ وەربگرێت تا بەرەو رۆژهەڵات بروات. عەبدولسەلام رازی بوو، دڵی عامری نەرم کرد و ئەمانی بۆ وەرگرت تا رێگەی تونس بگرێتەبەر و

کەسەکانی پارێزگاری لێ بکەن.

مەنسور لەئەریس هاتەدەر و عامر ئەوی لەگەڵ چەند سوارێك بۆ تونس ڕەوانە کرد بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی فەرمانی بەراسپێردراوێکی خۆیدا بیباتە جەربە و زیندانی بکات. راسپێردراو ئەو کارەی کرد و مەنسور و حەمدونی برای خستە زیندانەوە.

کاتێك عەبدولسەلام ئاگادار بوویەوە، ئەم کارەی پەسەند نەکرد. عامر نامەی بۆ براکەی نووسی کەفەرمانداری جەربە بوو، فەرمانی کوشتنی مەنسور وبراکەی پێدا و لەمبارەوە راوێژی بەکەس نەکرد. کارگوزاری جەربە ڕۆشتە لای ئەو دوانە و نامەکەی عامری بۆ خوێندەوە. مەنسور داوای کاغەز و مەرەکەبی کرد تا وەسیەت نامەکەی بنووسێت. کارگوزار فەرمانیدا کاغەز و مەرەکەبی بۆ بێنن بەڵام مەنسور نەیتوانی هیچ بنوسێت و تەنیا ئەم رستەی هێنایە سەرزمان: کوژراوی (من) چاکە و خێری هەر دوو دنیای بەدەست هێنا. کارگوزار هەردووکیانی کوشت و سەرەکانی بۆ عامر نارد. بارودۆخ بۆ عامر کوڕی نافیع سەقامگیر بوو و عەبدولسەلام کوڕی موفەرەج بۆ شاری باجە گەڕایەوە. عامر لەتونس مایەوە و لەکۆتایی مانگی رەبیع الاخری ساڵی ٢١٤ کۆچی/ ٨ ژوئەنی ٨٢٩ زایینی مرد. کاتێك زیادە الله لەمەرگی ئەو دوانە ئاگادار بوویەوە، وتی: ئاگری جەنگ دامرکایەوە. منداڵەکانی ئەو داوای ئەمانیان لەزیادە الله کرد و ئەمانی پێ بەخشین و چاکەی لەگەڵ کردن.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی تاهیر هاتە مەدینە ئەلسلام و عەباس کوڕی مەئمون و موعتەسەم و کەسانی دیکە پێشوازییان لێکرد.

لەم ساڵەدا موسا کوڕی حەفس مرد و کوڕەکەی لەسەر تەختی پاشایەتی تەبەرستان دانیشت و حاجب کوڕی ساڵح فەرمانڕەوایی سندی گرتەدەست بەڵام بیشر کوڕی داود ئەوی دەرپەڕاند و حاجب پەنای بۆ کرمان برد.

لەم ساڵەدا مەئمون فەرمانیدا و جاڕیاندا: هەرکەس بەچاکە ناوی معاویە بێنێتە

سەرزمان یا ئەو پێش یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بخات، خوێنی لەئەستۆی خۆیدایە.

لەم ساڵەدا نێردراوی مەرگ، کۆتایی بەژیانی باوکی عەتاهییەی شاعیر (ئێرانی عەرەب زمان کەخەیام لەچوارینەکانی خۆی هۆنراوەکانی ئەوی وەرگرتووە) هێنا و ساڵح کوڕی عەباس کارگوزاری مەککە، ڕێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا پیاوێك بەناوی توریل لەکەنارەکانی تاکورنانی ئاندۆلۆس ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو دەستەیەك لەسەربازەکانی کوشت کە بەمەبەستی کڕین و فرۆش هاتبوونە گوندەکانی تاکورنای و چوارپێ و کەرەستەکانی جەنگی ئەوانی تالآن کرد. کارگوزاری تاکورنا شوێنپێی هەڵگرت.

لەم ساڵەدا ئەخفەش، نەحوی بەسری لەم جیهانە ماڵئاوایی کرد. (دەڵێن لەسەرەتادا لەبەر ئەوەی قوتابی نەبوو، بزنەکەی خۆی فێر دەکرد و کاتێك بزنەکە نەیدەتوانی وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە، گوێچکەی رادەکێشا و بزنە دەهاتە دەنگ و ئەو دەنگەکەی بەنیشانەی تێگەیشتن و رازی بوون لەقەڵەم دەدا. لەو کاتەوە وەك بزن، ئەخەفش ناوی دەرکرد)

لەم ساڵەدا تەڵق کوڕی غەنامی نوخەعی و ئەحمەد کوڕی ئیسحاقی حەزرەمی و عەبدولرەحیم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەدی موحاربی کۆچی دواییان کرد.

لەم ساڵەدا عەبد رەزاق کوڕی هومامی سەنعانی حەدیس بێژ لەمامۆستاکانی ئەحمەد کوڕی حەنبەل، مرد.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی داودی خەربی بەسری کە لەخوربیەی بەسرە دەژیا و ناوەکەی لەو شوێنەوە وەرگرتووە، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و دوانزەی کۆچی ( ٨٢٧ زایینی )

## زاڵبوونی محەممەد کوڕی حومەید لەموسڵ

لەم ساڵەدا مەئمون، محەممەد کوڕی حومەیدی توسی بۆ جەنگی بابەکی خوڕەمی ڕەوانە کرد. مەئمون فەرمانی پێدا لەموسڵەوە بڕوات و کاروبارەکانی ئەو دیارە سامان بدات و زورەیق کوڕی عەلی سەرکوت بکات. محەممەد لەگەڵ سوپاکەی ڕۆشتە موسڵ و پیاوانی ڕەبیعە و یەمەن کەسەرۆکەکەیان محەممەد کوڕی سەیید کوڕی ئەنسی ئەزدی بوو، لەموسڵ برد و مەبەستی جەنگی زورەیقی کرد. کاتێك زورەیق ئاگادار بوویەوە، هێرشی کردە سەریان. دو سوپا لەزاب لەیەك نزیك بوونەوە. محەممەد کوڕی حومەید داوای لێکرد ملکەچی فەرمانەکان بێت بەڵام زورەیق ڕازی نەبوو. محەممەد جەنگی دەست پێکرد. دوو سوپا دەستیان بۆ شمشێر برد و ئەزدییەکان بەسەرۆکایەتی محەممەد کوڕی سەیید بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی سەیید کوڕی ئەنس پێداگرییان کرد، زورەیق و سوپاکەی شکستیان خوارد. دواتر زورەیق داوای ئەمانی کرد و محەممەد ئەمانی پێ بەخشی. زورەیق هاتە لای محەممەد و ئەو ڕەوانەی بارەگای مەئمونی کرد.

مەئمون فەرمانێکی بۆ محەممەد نووسی و داوای لێکرد هەموو سامانەکانی زورەیق لەپارە تا گوند و زەوی بگرێت. ئەو، ئەم سامانانەی بۆ خۆی وەرگرت. محەممەد منداڵ و کوڕەکانی زورەیقی کۆکردەوە و لەفەرمانەکەی مەئمون ئاگاداری کردنەوە. ئەوان ملکەچ بوونی خۆیان نیشاندا. محەممەد پێی وتن: سەروەری باوەڕداران فەرمانی ئەو کارەی پێداوم و پێی ڕازی بووم، هەنووکە منیش بەئێوەی دەبەخشم، کەواتە بڕۆن وسپاسی خواوەند بکەن.

محەممەد ڕێگەی ئازەربایەجانی گرتەبەر و محەممەد کوڕی سەییدی وەك جێگری خۆی دانا و مەبەستی سەرکوت کردنی نەیارەکانی ئازەربایەجانی کرد. یەعلی کوڕی مورە و هەمالەکییەکان لەناو ئەواندا دەبینران. ئەوانی گرت و ڕەوانەی دەرگای مەئمونی کردن. دواتر بەمەبەستی جەنگ لەگەڵ بابەکی خوڕەمی درێژەی بەڕێگەکەیدا.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی محەممەدی عومەری ناسراو بەسورچاو لەیەمەن، مەئمونی لەخەلافەت لابرد. مەئمون، محەممەد کوڕی عەبدولحەمید ناسراو بەباوکی رازی وەك فەرمانداری یەمەن دەستنیشان و ڕەوانەی ئەو سەرزەمینەی کرد.

لەم ساڵەدا مەئمون، باوەڕ بەنافڕاندنی قورئان و لەپێشی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەسەر ئەسحابەکانی دیکە ئاشکرا کرد. ئەو عەلی کوڕی ئەبی تالیبی دوای پێغەمبەر(د.خ) بەگەورەترینی خەڵکان لەقەڵەمدا. ئەم کارە لەمانگی رەبیعی الاوەل/ ٣٠ مەی ڕوویدا.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەباس کوڕی محەممەد ڕیَ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەرد هەژێنێکی گەورە یەمەنی لەراندەوە. ئەم ئەرد هەژێنە لەعەدەن گەورەتر لەشوێنەکانی دیکە بوو کەبەهۆیەوە ماڵەکان وێران و گوندەکان خاپور بوون و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ سەرزەمینی ناباوەڕان ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە گەیشتە بارسەلۆنا و دواتر گەیشتنە جەرەندە و لەرەبیع الاوەل/ ٣٠ مەی شەڕیان لەگەڵ دانیشتوانی ئەوشارانە کرد. سوپاکەی عەبدولرەحمان دوو مانگی بەتالآنی و کوشت وبڕ بەسەر برد.

هەروەها لەم ساڵەدا باران بارینە فراوانەکانی ئاندۆلۆس، چەندین لافاوی گەورەی لێکەوتەوە و زۆربەی دیوارەکانی کەناری ئاندۆلۆس و پردی ساراگوزای وێران کرد. چەندین ساڵ دواتر سەر لەنویَ ئاوەدانیان کردەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یوسف کوڕی واقد کوڕی عەبدواللەی زەببی ناسراو بەفریابی لەمامۆستاکانی بوخاری، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و سیانزەی كۆچی ( ٨٢٨ زایینی )

لەم ساڵەدا مەئمون، فەرمانڕەوایەتی جەزیرە، كەرانەكان و شارەگەورەكانی بەعەباسی كوڕی و فەرمانڕەوایەتی شام و میسری بەبراكەی، باوكی ئیسحاق موعتەسەم بەخشی و فەرمانیدا بەهەركامیان و بەتاهیر پێنسەد هەزار درهەم بدەن. دەڵێن: مەئمون هیچ ڕۆژێك بەئەندازەی ئەو ڕۆژە پارەی نەبەخشی.

لەم ساڵەدا عەبدولسەلام و كوڕی جولەیس، مەئمونیان لەناو هۆزی قەیس و یەمەنی میسر لەخەلافەت لابرد. ئەوان دژی كوڕی عومەیرە كوڕی وەلیدی بادغەیسی، كاگوزاری موعتەسەم شۆڕشیان كرد و لەرەبیع الاوەلی ساڵی ٢١٤/ ٩ مەی ٨٢٩ زایینی خوێنیان ڕشت. موعتەسەم ڕێگەی میسری گرتەبەر و شمشێری بەرووی ئەو دوانەدا هەڵكێشا و سەركوتی كردن و دەستی بەسەردا گرتن و بارودۆخی ئەم سەرزەمینە سەقامگیر و كارگوزارەكانی خۆی ڕەوانە كرد.

هەروەها لەم ساڵەدا تەڵحە كوڕی تاهیر لەخوراسان كۆچی دووایی كرد.

هەروەها لەم ساڵەدا مەئمون، غەسان كوڕی عوبادی وەك فەرمانڕەوای سند دیاری كرد چوونكە بیشر كوڕی داود ڕێگەی ناسازگای مەئمونی گرتبووەبەر و باجی بۆ مەئمون نەناردبوو. لەبەر ئەمە مەئمون بڕیاریدا غەسان لەجێگەی ئەو بنێرێت. مەئمون بەكەسانی دەوروبەری خۆی وت: من لەهەڵس و كەوتی غەسان ئاگادار بكەنەوە چوونكە دەمەوێت كارێكی گەورەی پێ بسپێرم. هەموویان وەسفیان كرد. مەئمون سەیری ئەحمەد كوڕی یوسفی كرد كەهێشتا بێدەنگ بوو. پرسی: ئەحمەد، تۆ چی دەڵێیت؟ ئەحمەد وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، چاكییەكانی زیاترە لەخراپەكانی، بۆ لای خەڵكانێك ڕەوانە ناكرێت مەگەر ئەوەی بارودۆخ سەقامگیر و هێوەر بكاتەوە. پرسیاری ئەو مەكە چوونكە هیچ كارێك ئەنجام نادات كەداوای لێ بوردنی بۆ بكات. ئەویش وەسفی غەسانی كرد. مەئمون وتی: تۆیش بەڕەشبینی خۆت وەسفی ئەوت كرد. من لەگەڵ ئەو بەو شێوەم كەشاعیر دەڵێت:

كفی شكرا لما اسدیت انی          صدقتك فی الصدیق و فی عداتی

واتاكەی: سپاسی من لەبەرابەر چاكەكانی تۆ بەس كە لەراستانی دۆست و دوژمن راستی دێنمە سەرزمان.

بێژەر دەڵێت: مەئمون لەوتە و ئەدەبی ئەحمەد، سەری سوڕما.

لەم ساڵەدا عەبدوالله کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا لەئاندۆلۆس، هاووڵاتیانی ماردە خوێنی کارگوزارەکەی خۆیان ڕشت و شۆڕش لەناویاندا هاتە کایەوە و عەبدولرەحمان سوپایەکی بۆ سەرکوت کردنی ئەوان ڕەوانە کرد. سوپاکەی عەبدولرەحمان گەمارۆی خستنەسەر و کوشت وکوشتاری خستەگەڕ و بەمشێوەیە خەڵکانی شارەکە ملکەچ بوون. چەندین بارمتەیان لێ وەرگیرا و سوپاکە دوای ئەوەی دیواری شارەکەی وێران کرد، گەڕایەوە. عەبدولرەحمان پەیامی بۆ ناردن کەدەبێت بەردی دیوارەکە لەدەوروبەری شارەکە تا کەنار ڕوبارەکە ببەن تا چیتر کەس بیر لەدروست کردنەوەی دیوارەکە نەکاتەوە. کاتێك خەڵکان ئەمەیان بیست، جارێکی دیکە ئاگری شۆڕشیان خۆش کرد و کارگوزارەکەیان ئەسیر و دیوارەکەیان دروست کردەوە.

لەساڵی ٢١٤/ ٨٢٩ زایینی، عەبدولرەحمان پاشای ئاندۆلۆس، لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕێگەی ماردەی گرتەبەر و بارمتەکانی لەخەڵکی ئەوشارە لەگەڵ خۆی برد. کاتێك خەڵکانی ماردە ئەمەیان بینی پێشنیاریان کرد عەبدولرەحمان بارمتەکانی ئەوان ئازاد بکات و لەبەرابەردا ئەوان کارگوزارەکەی ئازاد دەکەن. عەبدولرەحمان دەوری شارەکەی گرت، وێرانی کرد و دواتر گەڕایەوە.

جارێکی دیکە لەساڵی ٢١٧/ ٨٣٢ زایینی هێرشی کردەسەریان و گەمارۆی خستنەسەر و بارودۆخی لێ دژوار کردن. ئەم گەمارۆیە درێژەی کێشا و عەبدولرەحمان گەڕایەوە.

لەساڵی ٢١٨/ ٨٣٣زایینی دووبارە عەبدولرەحمان هێرشی کردەسەر ماردە و دەستی بەسەردا گرت. خراپەکاران هەڵاتن. یەکێك لەسەرکردەکانی ئەم شارە بەناوی مەحمود کوڕی عەبدولجەباری ماردی، کەوتە بۆسەی عەبدولرەحمان و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکان. سەربازەکانی عەبدولرەحمان پیاوانە جەنگان و سەرئەنجام شکستیاندا و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانیان کوشت. سوپاکەی عەبدولرەحمان پاشماوەکانی ئەوانیان تاڵان کرد و تا کوێستانەکان شوێنیان کەوتن. سەربازەکانی عەبدولجەباریان کوشت و ئاوارەیان کردن.

مەحمود کوڕی عەبدولجەباری ماردی لەگەڵ پاشماوەی هاوڕێکانی بۆ مەنت

سالوت رایان کرد.

عەبدولرەحمان لەساڵی ٢٢٠ کۆچی/ ٨٣٥ زایینی سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو نارد. عەبدولجەبار و سەربازەکانی لەرەبیع الاخر/ ١٩ ژوئەن بۆ حەلقەب هەڵاتن. عەبدولرەحمان دەستەیەك لەسوپاکەی بەشوێن ئەواندا ڕەوانە کرد. مەحمود رووبەروویان بوویەوە و شکستی پێهێنان و سامانەکانی ئەوانیان تاڵان کرد و دووبارە درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا و لەرێگە رووبەرووی دەستەیەك لەسەربازەکانی عەبدولرەحمان بوونەوە. دوو سوپا رووبەرووی یەك بوونەوە بەڵام هیچ کام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت و بەمشێوەیە دەستیان لەجەنگ هەڵگرت. سوپاکەی عەبدولجەبار درێژەی بەرێگەکەیدا ودووبارە رووبەرووی دەستەیەکی دیکە لەسەربازەکانی عەبدولرەحمان بوونەوە. مەحمود توانی شکست بەم دەستەیە بێنێت و سامانەکانیان تاڵان بکات.

عەبدولجەبار لەڕۆشتن بەردەوام بوو و گەیشتە مینە. هێرشی کردەسەر شارەکە و دەستی بەسەردا گرت. سەربازەکانی چوارپێ و خواردەمەنییەکانی شارەکەیان تاڵان کرد و لەوێ ڕۆشتن و روویان کردە سەرزەمینی ناباوەڕان و دەستیان بەسەر قەڵایەکی ئەواندا گرت. پێنج ساڵ و سێ مانگ لەوێ مانەوە تا ئەوەی ئەزفونس پاشای فەرەنگەگان دەوری گرتن و قەڵاکەی لێ سەندنەوە و مەحمود و سوپاکەی کوشتار کرد. ئەم رووداوە لەرەجەبی ساڵی ٢٢٠/ ٣٠ ژوئەنی ٨٣٤ زایینی روویدا. دوای ئەم پێشهاتە، دانیشتوانی ئەو قەڵایە کۆچیان کرد.

لەم ساڵەدا ئیبراهیمی موسڵی گۆرانی بێژ یا هەمان ئیبراهیم کوڕی ماهان باوکی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی ماهان کۆچی دوایی کرد. ئەو خەڵکی کوفە بوو بەڵام لەموسڵ مایەوە. کاتێك گەڕایەوە بۆ کوفە بەموسڵی ناویان برد. (ئیبراهیم کوڕی ماهان و منداڵەکەی ئیسحاق، هەردووکیان ئێرانی و موسیقار و لەکەسە بەناوبانگەکانی ئێران و جیهان و هەردووك بیرمەند و هونەرمەند بوون.)

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی جەبەلە کوڕی موسلیم باوکی حەسەنی شاعیر کە لەساڵی ١٦٠ کۆچی/ ٧٧٦ زایینی، مرد. پێش مردنی کوێر ببوو.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەرعەرە کوڕی ئیلبوەند و باوکی عەبدولرەحمانی موقەری و حەدیس بێژ و عەبدوالله کوڕی موسای عەبەسی فەقیهی شیعی کە لەمامۆستاکانی بوخاری بۆ نوسینی (صحیح) بوو، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چواردەی کۆچی ( ٨٢٩ زایینی )

## کوژرانی محەممەد کوڕی حومەیدی تـوسی

لەم ساڵەدا بابەکی خوڕەمی، محەممەد کوڕی حومەیدی توسی کوشت. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك محەممەد کوڕی حومەیدی توسی ڕێگەی لەچەتە و ڕێگرەکان پاك کردەوە، مەبەستی جەنگی بابەکی کرد. ئەو سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە، کەرەستەی جەنگ و توێشوی بەئەندازەی پێویست هەڵگرت و سوپایەکی گەورە لەهێزە خۆبەخشەکانی شارەکانیتر پەیوەستی بوون. محەممەد هەموو ڕێگە دژوارەکان بۆ گەیشتن بەبابەکی بڕی. لەهەر گەردەنە یا دۆڵێك کەگوزەری دەکرد، سوپایەکی بۆ پاراستنی دادەنا تا ئەوەی گەیشتە هەشتاسەر و لەوێ خەندەکی بەدەوری سوپاکەی هەڵکەند و بۆ ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی بابەك و سوپاکەی راوێژی لەگەڵ کەسە نزیکەکانی کرد. ئەوان پێیان وت هێرش بکاتە سەر سەرزەمینی بابەك. محەممەد کوڕی حومەیدی توسی بۆچوونی ئەوانی پەسەند کرد و سوپاکەی رازاندەوە. محەممەد کوڕی یوسف کوڕی عەبدولرەحمانی تائی ناسراو بەباوکی سەعیدی وەك فەرماندەی ناوەڕاستی سوپا، سەعدی کوڕی ئەسرەمی وەك فەرماندەی باڵی راست و عەباس کوڕی عەبدولجەباری یەقتینی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دیاریکرد. محەممەد کوڕی حومەیدی توسی لەگەڵ دەستەیەك لەدواوە سەیریان دەکرد و هەرکات کەڵێنێکی لەبەشێکی سوپاکەی دەبینی، فەرمانی دەدا، بەهێزە پشتیوانەکان پڕی دەکردەوە. بابەك لەسەر کێوەکانەوە چاودێری جووڵەی ئەوانی دەکرد و لەژێر هەر تاشەبەردێك چەند کەسێك خۆیان حەشاردابوو.

کاتێك سەربازەکانی محەممەد پێشڕەوییان کرد و سێ فەرسەخ لەکێوەکەیان بڕی، ئەوانەی خۆیان حەشاردابوو، هاتنەدەر و بابەك لەگەڵ سەربازەکانی لەکێوەکە هاتنەخوار. سوپاکەی محەممەد شکستی خوارد. باوکی سەعید و محەممەد کوڕی حومەید بۆ خۆراگری هانیان دەدان بەڵام کەس گوێی لەوتەکانیان نەدەگرت و

هەرکام شوێنێکی بۆ هەڵاتن هەڵبژارد و لەکاتی هەڵاتن لەلایەن سەربازەکانی بابەکەوە دەکوژران. محەممەد کوڕی حومەید لەشوێنەکەی خۆی خۆڕاگری دەکرد و چەند کەس لەهاوەڵانی هەڵاتن و بۆ ڕزگار بوونی خۆیان پەڕینە سەرئەسپەکان. محەممەد لەناکاو دەستەیەکی بینی شمشێریان دەرکێشاوە و دەجەنگن، ڕووی کردە ئەوان. بینی دەستەیەك لەخوڕەمییەکانن کە لەگەڵ سوپاکەی دەجەنگن. خوڕەمییەکان کاتێك ژنە جوانەکەی ئەویان بینی، ڕووبەڕووی بوونەوە و شمشێریان دەرکێشا. ئەسپەکەی محەممەدیان بەزوبین لەپێ خست. محەممەد کەوتە سەرزەوی. سەربازەکان هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت.

محەممەد بەخشندە بوو. شاعیرەکان بۆ وەسف کردنی تایبەتمەندییەکانی ئەو چەندین هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە کەیەکیان تائی بوو. کاتێك مەئمون لەمەرگی محەممەد ئاگادار بوویەوە، خەمبار و عەبدوللە کوڕی تاهیری بۆ جەنگی بابەك ڕەوانە کرد. عەبدوللە ملی ڕێگەی گرتەبەر.

## بەسەرهاتی باوکی دۆلف و مەئمون

باوکی دۆلف لەهاوەڵانی محەممەد ئەمین بوو کەهاوڕێ لەگەڵ عەلی کوڕی عیسا کوڕی ماهان بۆ جەنگی تاهیر کوڕی حسەین ڕۆشت و کاتێك عەلی کوژرا، باوکی دۆلف بۆ هەمەدان گەڕایەوە. تاهیر نامەیەکی بۆ نووسی و دڵنەوایی کرد و داوای لێکرد بەیعەت لەگەڵ مەئمون بکات بەڵام ڕازی نەبوو و لەوەڵامدا وتی: بەیعەتێکم لەئەستۆدایە و بۆ پچڕاندنی هیچ ڕێگە چارەیەك نابینم، بەڵام لەشوێنەکەی خۆم دەمێنمەوە و ئەگەر کارت پێم نەبێت، لایەنگری لەهیچ دەستەیەك ناکەم. تاهیر ڕازی بوو. باوکی دۆلف لەکەرج نیشتەجێ بوو.

کاتێك مەئمون ڕۆشتە ڕەی، نامەیەکی بۆ باوکی دۆلف نووسی و پێشنیاری پەیوەست بوونی پێکرد. باوکی دۆلف بەترسەوە ڕووی کردە بارەگای مەئمون. خزمان و کەسەکانی پێیان وت: تۆ سەروەری عەرەبەکانی و هەمووان شوێنکەوتەی فەرمانەکانی تۆن، ئەگەر دەترسی لێرە بمێنەرەوە و ئێمە پارێزگاریت لێ دەکەین. باوکی دۆلف گرنگی بەوتەکانیان نەدا و لەکاتێکدا ئەم هۆنراوەی دەخوێندەوە،

ڕووی کردە بارەگای مەئمون:

اجود بنفسی دون قومی دافعا ... لمانا بهم قدما و اغشی الدواهیا

و اقتحم الامر المخوف اقتحامه ... لادرك مجدا او اعاود ثاویا

واتاکەی: من گیانی خۆم دەبەخشم تا لەوەی پێشتر بەکەسەکانی من گەشتووە، پشتیوانییان لێ بکەم و خۆم دەخەمە باوەشی زیانەوە. بۆ هەر کارێکی مەترسیدار بوێری لەخۆم نیشان دەدەم تا ڕێزداری بەدەست بێنم یا بکەومە سەرزەوی (بمرم).

کاتێك ڕۆشتە لای مەئمون، ڕێزی لێگرت و چاکەی لەگەڵ کرد. گومان و دوودڵی ئەوی نەهێشت و پێگەیەکی بەرزی پێ بەخشی.

## دیاریکردنی عەبدواللە کوڕی تاهیر وەك فەرمانڕەوای خوراسان

لەم ساڵەدا مەئمون، عەبدواللە کوڕی تاهیری وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاریکرد. عەبدواللە ڕێگەی ئەم دیارەی گرتەبەر.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك تەڵحە، برای عەبدواللە مرد، عەلی کوڕی تاهیر جێگرەوەی براکەی عەبدواللە، وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاریکرا. لەو کاتەدا عەبدواللە لەدینەوەرد بۆ جەنگ دژی بابەك سوپای کۆدەکردەوە کە لەناکاو خەواریجی خوراسان خەڵکانی گوندی حەمرای نەیشابووریان کوشتار کرد. مەئمون لەم کوشتارە ئاگادار بوویەوە و فەرمانی بەعەبدواللە کوڕی تاهیردا بەرەو خوراسان بڕوات. عەبدواللە ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە نەیشابوور، بینی وشکەساڵی بەرۆکی ئەم شارەی گرتووە و تەنیا یەك ڕۆژ پێش هاتنی ئەو باران باریوە. کاتێك عەبدواللە هاتە نەیشابور، پیاوێك بەناوی بەزاز ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

قد قحط الناس فی زمانهم ... حتی اذا جئت جئت بالدرر

غیثان فی ساعة لنا قدما ... فمرحبا بالامیر و المطر

واتاکەی: خەڵك لەرۆژگاری خۆیان گرفتاری وشکەساڵی بوون تا ئەوەی تۆ هاتیت و گەوهەرت لەگەڵ خۆت هێنا. لەیەك کاتدا دوو جۆر باران باری، کەواتە سڵاو لەپاشا و سڵاو لەباران.

عەبدوالله ئەوی بانگ کرد و وتی: ئایا تۆ شاعیریت؟ وتی: نە بەڵام ئەم هۆنراوەم لەرەققە بیست و لەبەرم کرد. عەبدوالله چاکەی لەگەڵ کرد و فەرمانیدا هەر جل وبەرگێك کەبفرۆشرێت بەدەستی ئەو و فەرمانی ئەو بێت (چوونکە بەزاز بوو).

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا بیلالی غەسانی شاری[٧] شۆڕشی کرد. مەئمون، عەباسی کوڕی و دەستەیەك لەسوپاسالارەکانی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و کوشتیان.

لەم ساڵەدا باوکی رازی لەیەمەن مرد.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی داودی قومی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. عەزیز موالی عەبدوالله کوڕی تاهیر ئەوی گرت. ئەو لەمیسر هەڵاتبوو و بۆ ئەو سەرزەمینە دوور خرایەوە.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی هوشام فەرمانڕەوایەتی کێوەکان[٨] و قوم و ئیسفەهان و ئازەربایەجانی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا ئیدریس کوڕی ئیدریس کوڕی عەبدوالله کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەغریب کۆچی دوایی کرد و دوای ئەو کوڕەکەی محەممەد، فەرمانڕەوایەتی فاسی گرتەدەست. محەممەد براکەی، قاسمی وەك فەرمانڕەوای بەسرە و تەنجە و ناوچەکانی دەوربەری دیاریکرد و براکانی تری وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینی بەربەرەکان دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی پاشای ئاندۆلۆس هێرشی کردە سەر شاری باجە کە لەسەردەمی شۆڕشی مەنسورەوە هێشتا نائارام بوو. عەبدولرەحمان دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت.

لەم ساڵەدا هاشمی زەڕاب لەتەلێتەلەی (تۆلدۆ) ئاندۆلۆس لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەو شارە رێگەی ناسازگاری گرتەبەر. هاشم لەو کەسانە بوو کاتێك حەکەم دەستی بەسەر تۆلدۆدا گرت، ماڵئاوایی لەم شارە کرد و رووی کردە کوردوبا و لەم رۆژەدا

---

[٧] لەمێژووی تەبەری بەزەبابی ناوی براوە. دەستەیەك بەسەبانی ناوی دەبەن. (وەرگێر)

[٨] مەبەست کوێستانەکانی کرماشان و لورستانە. (وەرگێر)

دووبارە بۆ ئەو شارە گەڕایەوە. خراپەکاران لەدەوری کۆبوونەوە. لەگەڵ ئەوان هێرشی کردە سەر سەرزەمینی نەحوییە و بەڕبەڕییەکان و شوێنەکانی دیکە و بەمشێوەیە پێگە و ناوبانگی بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆر پەیوەستی بوون. دواتر هێرشی کردە سەر خەڵکانی شەنت بەرییە.

لەنێوان ئەو و بەڕبەڕەکان چەندین جەنگ روویدا. لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان، سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. دوو سوپا رووبەرووی یەك بوونەوە بەلاّم کەسیان نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. هاشم مایەوە و توانی چەند ناوچەیەکی دیکەیش بخاتە ژێر دەسەلاّتی خۆیەوە. لەبرکە ئەلعەجوز گوزەری کرد و سوارەکانی درێژەیان بەپێشڕەویدا. عەبدولرەحمان لەساڵی ٢٢٠ کۆچی/ ٨٣٥ زایینی سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و هاشم لەنزیك سومستا رووبەروویان بوویەوە و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و چەند رۆژێك درێژەی کێشا بەلاّم سەرئەنجام هاشم شکستی خوارد و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەخراپەکاران کوژران. خواوەند خەڵکی لەشەڕی ئەوان رزگار کرد.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی عەباس کوڕی محەممەد ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی هاشم نەبیل کەناوی زوحاك کوڕی محەممەدی شەیبانی بوو، مرد. پێشەوای حەدیس بوو.

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد حسەین کوڕی محەممەدی بەغدادی مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پانزەی کۆچی ( ٨٣٠ زایینی )

### لەشکرکێشی مەئمون بۆ ڕۆم

لەموحەڕەمی ئەم ساڵە/ ٢٨ فەوریە، مەئمون هێرشی کردە سەر ڕۆم. کاتێك بەرێکەوت، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەبی وەك جێگری خۆی دانا و دەوروبەری عێراق و حولوان و گوندەکانی دیجلەی خستە ژێر فەرمانی ئەو. کاتێك مەئمون گەیشتە تکریت، محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عە لی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ئیمامی نۆیەمی شیعەکان و منالی ئیمام ڕەزا ناسراو بەجەواد و تەقی) بۆ دیداری ڕۆشت. مەئمون چەندین دیاری گرانبایی پێبەخشی و کچەکەی، دایکی فەزڵی کردە هاوسەری ئەو. ئەو پێشتر کچەکەی کردبووە هاوسەری محەممەد کوڕی عەلی. تازە بووکیان هێنایە ماڵی زاوا و لەکاتی حەج، مەئمون بنەماڵەکەی ڕەوانەی مەدینە کرد و خۆی لەوێ مایەوە.

مەئمون لەرێگەی موسڵەوە پێشڕەوی کرد تا گەیشتە مەنبەج و لەوێوە ڕێگەی دابق و دواتر ڕووی کردە ئەنتاکییە و لەوێوە بەرەو مەسیسە و تەرتوس، ئەسپی غاردا. لەجومادی الاوەل، ٢٦ ژوئەنی ئەم ساڵە لەو ناوچەوە ڕێگەی ڕۆمی گرتەبەر. عەباسی کوڕی لەمەلیتەوە هێرشی برد. مەئمون گەمارۆی خستە سەر قەڕە و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و لە ٢٦ جومادی الاوەل ٢١ فەوریە وێران و خاپوری کرد. دانیشتوانی ئەم قەڵایە داوای ئەمانیان کرد و مەئمون ئەمانی پێ بەخشین. پێشتر بەبەخشینی ئەمان بەدانیشتوانی قەڵای ماجدە، دەستی بەسەردا گرتبوو. ئەشناسی بۆ گرتنی قەڵای سندس ڕەوانە کرد. ئەشناس سەرۆکی ئەو شارەی گرت و بردییە لای مەئمون. (ئەشناس سەرکردەیەکی ئێرانی بوو چوونکە لەیەکێك لەجەنگەکانی موعتەسەم پێش خەلافەت، گرفتاری هێرشی پاڵەوانێك بوو کەنزیك بوو قاچی بقرتێنێت. ئەشناس پاڵەوانەکەی کوشت و بەموعتەسەمی وت: ئەشناس مەرا (من بناسە). مەئمون عوجەیف و جەعفەری خەیاتی بۆ لای فەرماندەی قەڵای سەناز نارد و ئەو ملکەچی خۆی نیشاندا.

لەم ساڵەدا موعتەسەم لەمیسر گەڕایەوە و پێش ڕۆشتنە ناو موسڵ، چاوی بەمەئمون کەوت. مەنویل و عەباس کوڕی مەئمون. لەرەئس عەین پێشوازییان لەموعتەسەم کرد.

لەم ساڵەدا مەئمون دوای گەڕانەوە لەرۆم. رووی کردە دیمەشق. عەبدوڵلە کوڕی عەبدوڵلە کوڕی عەباس کوڕی محەممەد لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا قەبیسە کوڕی عوقەبەی سوائی و باوکی یەعقوب ئیسحاق کوڕی تەباخی فەقیە و عەلی کوڕی حەسەن کوڕی شەقیق؛ یار کوڕی موبارەك و سابت کوڕی محەممەدی کێندی خواپەرەستی حەدیس بێژ و هوزە کوڕی خەلیفە کوڕی عەبدوڵلە کوڕی عوبەیدوڵلە کوڕی ئەبی بەکرە باوکی ئەشهەب و باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی حارسی موسڵی و باوکی سلێمانی دارانی لەداریا و مەکی کوڕی ئیبراهیمی تیمی بەڵخی لەبەلخ (لەمامۆستاکانی بوخاری لەنوسینەوەی (صحیح) و ساڵەکانی تەمەنی سەد ساڵ درێژەی کێشا) و باوکی زەید سەعید کوڕی ئەوس کوڕی سابتی ئەنساری کەنەوەد و سێ ساڵ تەمەنی کرد، مردن.

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی قەریب کوڕی عەبدولمەلیك باوکی سەعیدی ئەسمەعی بەسریی مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بە ٢١٦/ ٨٣١ زایینی دەزانن. محەممەد کوڕی عەبدوڵلە کوڕی موسەنا کوڕی عەبدوڵلە کوڕی ئەنس کوڕی مالکی ئەنساری قازی بەسرە لەم ساڵەدا کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شانزەی کۆچی ( ٨٣١ زایینی )

## گرتنی هێرقلییە )

لەم ساڵەدا مەئمون بۆ سەرزەمینی ڕۆم گەڕایەوە چوونکە ئاگاداریان کردەوە پاشای ڕۆم هەزار و شەشسەد کەس لەخەڵکانی تەرتوس و مەسیسەی کوشتووە. ئەو لەجومادی الاوەل/ ١٥ ژوئەنی ٨٣٠ زایینی ڕۆشتە سەرزەمینی ڕۆم و تا نیوەی شەعبان لەوێ مایەوە.

هەروەها دەڵێن: هۆکاری ڕۆشتنەکەی بۆ ڕۆم ئەوە بوو پاشای ڕۆم نامەیەکی بۆ نووسی و پێش ناوی مەئمون، ئاماژەی بەناوی خۆیدا. مەئمون نامەکەی خوێندەوە و ڕێگەی ڕۆمی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە ڕۆم، لەئەنتیغوا ئوردووی لێدا. دانیشتوانی ئەو سەرزەمینە ملکەچی خۆیان نیشاندا. دواتر ڕووی کردە هێرقلییە و دانیشتوانەکەی خۆیان لەجەنگ دوور خستەوە.

مەئمون، موعتەسەمی برای ڕەوانە کرد. ئەو توانی دەست بەسەر سی سایلۆی گەنم و قەڵایەك بگرێت. دواتر مەئمون، یەحیا کوڕی ئەکسەمی لەتوانەوە ڕەوانە کرد. یەحیا، کوشتی و بڕی، سوتاندی و فڕاندی، ئەسیر کرد و تەندروست گەڕایەوە. مەئمون ڕێگەی کیسومی گرتەبەر و دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر بەرەو دیمەشق گەڕایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەبدوسی فیهری لەمیسر ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و دژی کارگوزارەکەی موعتەسەم ڕاپەڕی. دەستەیەك لەوان لەشەعبان کوژران و بەم شێوەیە مەئمون لەزیحەججە/ ٢٢ ژانویە لەدیمەشقەوە بەرەو میسر بەڕێکەوت.

لەم ساڵەدا ئەفشین لەبەرقەوە هات و لەمیسر نیشتەجێ بوو.

لەم ساڵەدا مەئمون نامەیەکی بۆ ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم نووسی و فەرمانی پێدا سەربازە نوێژ خوێنەکان بۆ وتنەوەی تەکبیر ناچار بکات. ئەم کارە لەنیوەی ڕەمەزان/ ٢٥ ئۆکتۆبەر دەستی پێکرد. سەربازەکان بۆ نوێژ ڕیزیان دەبەست و سێ

جار تەكبیریان دەوت. دواتر ئەم كارە لەهەر نوێژێك فەرز كرا.

لەم ساڵەدا مەئمون، لەعەلی كوڕی هاشم تورە و عوجەیف و ئەحمەد كوڕی هاشمی بۆ گرتنی سامان و كەرەستەكانی جەنگی ئەو ڕەوانە كرد.

لەم ساڵەدا دایكی جەعفەر، زوبەیدە، دایكی ئەمین لەبەغداد كۆچی دوایی كرد.

لەم ساڵەدا غەسان كوڕی عیباد لەسەرزەمینی سند گەڕایەوە و بیشر كوڕی داودی لەگەڵ خۆی هێنا كەداوای ئەمانی كردبوو. غەسان بارودۆخی سندی سەقامگیر كرد و عیمران كوڕی موسای عەتكی لەجێگەی خۆی دانا وگەڕایەوە.

لەم ساڵەدا جەعفەر كوڕی داودی قومی بۆ قوم هەڵات و شۆڕشی دەستپێكرد.

دەستەیەك دەڵێن: لەم ساڵەدا سلێمان كوڕی عەبدوالله كوڕی سلێمان كوڕی عەلی كوڕی عەبدوالله كوڕی عەباس ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا. دەستەیەكی دیكەیش گومان دەكەن عەبدوالله كوڕی عوبەیدالله كوڕی عەباس كوڕی محەممەد - عەلی كوڕی عەبدوالله كوڕی عەباس- ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. مەئمون فەرمانڕەوایەتی یەمەنی بەو سپاردبوو. مەئمون فەرمانیدا بوو هەنگاو بنێتە هەر شارێك، فەرمانڕەوایی ئەو شارە بۆ ئەو دەبێت. ئەو لەدیمەشقەوە بەرێكەوت و گەیشتە بەغداد و پێشنوێژی نوێژی جەژنی قوربانی كرد و لەوێوە بۆ ئەنجامدانی ڕێ و ڕەسمی حەج بەرێكەوت.

لەم ساڵەدا باوكی میسهەر عەبدولعەلی كوڕی میسهەری غەسانی لەبەغداد و كوڕی عیباد كوڕی عیباد كوڕی حەبیب كوڕی موهەلیب فەرماندەی بەسرە و یەحیا كوڕی یەعلی موحاربی و ئیسماعیل كوڕی جەعفەر كوڕی سلێمان كوڕی عەلی، مردن.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و حەڤدەی كۆچی ( ٨٣٢ زایینی )

لەم ساڵەدا ئەفشین، دەستی بەسەر فەرما لەسەرزەمینی میسر گرت و خەڵكەكەی بەوەرگرتنی ئەمان ملكەچی خۆیان بۆ فەرمانەكانی مەئمون دەربڕی. مەئمون لەموحەرەمی ئەم ساڵە/ ٦ فەوریە گەیشتە میسر.

لەم ساڵەدا مەئمون، عەلی كوڕی هوشامی كوشت. چۆنیەتییەكەی ئەوە بوو مەئمون ئەوی وەك فەرمانڕەوای ئازەربایەجان و كەنارەكانی دیكە دەستنیشان كرد بەڵام دواتر هەواڵی خراپەكاری و زەوت كردنی سامانی خەڵكان و كوشت و بڕی ئەو بەگوێی مەئمون گەیشت. مەئمون عوجەیف كوڕی عەنبەی بۆ لای ئەو نارد بەڵام عەلی ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر و مەبەستی ئەوەی كرد عوجەیف بكوژێت و دواتر پەیوەستی بابەك بێت. بەڵام عوجەیف بەسەریدا زاڵ بوو و ئەوی هێنایە لای مەئمون. مەئمون لەجومادی الاوەل/ ٤ ژوئەن خۆی و براكەی كوشت و سەری ئەوانی لەعێراق، شام، خوراسان بەناو خەڵكاندا سوڕاند و دواتر فڕیاندایە ناو دەریا.

لەم ساڵەدا مەئمون گەڕایەوە بۆ ڕۆم و بۆ ماوەی سەد ڕۆژ لە لۆلۆ ئوردووی لێدا. دواتر لەوێ كۆچی كرد و عوجەیفی لەو ناوچەیە بەجێهێشت. خەڵكانی ڕۆم فێڵیان لەعوجەیف كرد و گرفتاریان كرد. هەشت ڕۆژ لەناو ئەوان ئەسیر بوو بەڵام دواتر ئازادیان كرد. لەم كاتەدا تۆفەیلی پاشای ڕۆم هات و گەمارۆی خستە سەر عوجەیف. مەئمون سوپایەكی بۆ هاوكاری عوجەیف ڕەوانە كرد. خەڵكانی لۆلۆ داوای ئەمانیان لەعوجەیف كرد و پاشای ڕۆم خوازیاری دەست هەڵگرتن لەجەنگ بوو بەڵام بەمەبەستەكەی نەگەیشت.

لەم ساڵەدا مەئمون ڕێگەی سەلغوسی گرتەبەر.

لەم ساڵەدا عەلی كوڕی عیسای قومی بۆ جەنگی جەعفەر كوڕی داودی قومی ڕەوانە كرا بەڵام كوژرا و سلێمان كوڕی عەبدواللە كوڕی سلێمان كوڕی عەلی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا حەجاج كوڕی منهال لەبەسرە و سورەج كوڕی نەعمان و سەعدان كوڕی بیشری موسڵی ( كە لەسوفیان حەدیسی دەگێڕایەوە) و خەلیل كوڕی باوكی ڕافیعی موزنی موسڵی و باوكی، جەعفەر كوڕی محەممەد كوڕی باوكی یەزیدی موسڵی كەپیاوێكی فرەزان بوو، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەژدەی کۆچی ( ٨٣٣ زایینی )

## ئەزمونی قورئانی پیرۆز

لەم ساڵەدا مەئمون، نامەیەکی بۆ ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لەبەغداد نووسی و داوای لێکرد داوەرەکان و زاناکان و حەدیس بێژەکان سەبارەت بەقورئان ئەزمون بکات، ئەگەر باوەڕی کەسێك سەبارەت بەقورئان ئەوە بوو کەقورئان ئافرێنراوە، ڕێگەی بۆ بکەنەوە و زیانی لێ نەدەن و هەرکەس بەمە ڕازی نەبوو، مەئمونی لێ ئاگادار بکەنەوە تا خۆی سەبارەت بەوان بڕیار بگرێت. لەنامەکەیدا چەندین بەڵگە و بورهانی هێنایەوە کەقورئان ئافرێنراوە و دەبێت گرنگی بەوتەی کەسانی دیکە نەدرێت. ئەم نامەیە لەرەبیع الاوەل/ ٢٦ ژانویە نوسرا. فەرمانیدا حەوت کەس لەپێشەواکانی سوونی بۆ بارەگاکەی ڕەوانە بکەن: محەممەد کوڕی سەعدی کاتبی واقدی، باوکی موسلیم نوێنەری یەزید کوڕی هارون، یەحیا کوڕی موعین، باوکی خەیسەمە زوهەیر کوڕی حەرب، ئیسماعیل کوڕی داود، ئیسماعیل کوڕی باوکی مەسعود و ئەحمەدی دەوەرەقی. ئەم کەسانە برانە لای مەئمون. مەئمون سەبارەت بەقورئان پرسیاری لێکردن. هەموویان وتیان: قورئان ئافرێنراوە. مەئمون ئەوانی بۆ بەغداد گەڕاندەوە. ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم ئەوانی لەماڵەکەیدا کۆکردەوە و بەئامادەبوونی حەدیس بێژەکان بەوانی سەلماند کەقورئان ئافرێنراوە. بەمشێوەیە ڕێگەی بۆ ئەوان کردەوە.

دواتر نامەیەکی دیکەی مەئمون بەدەستی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم گەیشت تا داوەران و فەقیهەکان لەم ئەزمونەدا ئەزمون بکات. ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، باوکی حەسانی زیادی و بیشر کوڕی وەلیدی کیندی و عەلی کوڕی باوکی موقاتل و فەزڵ کوڕی غانم و زەیال کوڕی هەیسەم و سوبحادە و قەواریری و ئەحمەد کوڕی حەنبەل (پێشەوای چوارەمی سوونییەکان و سەرۆکی مەزهەبی حەنبەلی) و قوتەیبە و سەعدویەی واستی و عەلی کوڕی جوعد و ئیسحاق کوڕی باوکی ئیسرائیل و باوکی هەرش و کوڕی عەلییە ئەکبەر و یەحیا کوڕی عەبدولرەحمانی عومەری و پیاوێکی بەتەمەن لەوەچەی عومەر کوڕی خەتاب کەقازی ڕەققە بوو

لەگەڵ باوکی نەسری تەمار و باوکی مەعمەری قەتیعی و محەممەد کوڕی حاتەم کوڕی مەیمون و محەممەد کوڕی نوحی مەزروب و کوڕی فەرحان و دەستەیەکی دیکە: نەزر کوڕی شومەیل، کوڕی عەلی کوڕی عاسم، باوکی عەوامی بەزاز، کوڕی شوجاع و عەبدولرەحمان کوڕی ئیسحاقی کۆکردەوە. هەموویان لای ئیسحاق کۆبوونەوە و ئەو نامەکەی مەئمونی بۆ خوێندنەوە. دواتر بەبیشر کوڕی وەلیدی وت: سەبارەت بەقورئان دەڵێی چی؟ لەوەڵامدا وتی: زیاتر لەیەك جار سەروەری باوەڕدارانم لەباوەڕی خۆم ئاگادار کردۆتەوە. ئیسحاق وتی: دەبینی سەروەری باوەڕداران دووبارە نامەیەکی دیکەی نووسیوە. ئیسحاق پێی وت: قورئان فەرموودەی خواوەندە. ئیسحاق وتی: ئەوە پرسیاری من نەبوو، ئایا قورئان ئافرێنراوە یا نە؟ بیشر وتی: خواوەند ئافرێنەری هەر شتێکە. ئیسحاق وتی: ئایا قورئان شتە؟ بیشر وتی: بەڵێ. ئیسحاق وتی: ئایا ئافرێنراوە؟ بیشر وتی: ئافرێنەر نییە. ئیسحاق وتی: سەبارەت بەوە نەمپرسی. ئایا قورئان ئافرێنراوە؟ بیشر وتی: جگە لەوەی هێنامە سەرزمان، هیچی دیکە نازانم و پەیمانم لەسەروەری باوەڕداران وەرگرتووە لەوبارەوە قسە نەکەم و جگە لەوەی وتوومە، هیچی دیکە نازانم.

ئیسحاق نامەیەکی دەرهێنا و خوێندییەوە و لەناوەرۆکەکەی ئاگاداری کردەوە. بیشر وتی: شایەتی دەدەم خواوەند تاقانەیە و هیچ کام لەئافرێنراوەکانی هاوتای ئەو نییە. ئیسحاق وتی: با وابێت. بەدەبیرەکەی خۆی وت: ئەوەی دەیڵێت، بینوسە.

لەم کاتەدا بەعەلی کوڕی موقاتیلی وت: تۆ چی دەڵێیت؟ لەوەڵامدا وتی: تۆ لەمبارەوە وەڵامی من بۆ سەرورەی باوەڕدارانت چەندین جار بیستووە، وتەیەکی تازەم پێ نییە. ئیسحاق بەنامەکە ئەزمونی کرد و عەلی دانی بەراستی نامەکەدا هێنا و دواتر ئیسحاق لێی پرسی: ئایا قورئان ئافرێنراوە؟ وتی: قورئان فەرموودەی خواوەندە. ئیسحاق وتی: پرسیارەکەم ئەوە نەبوو. عەلی وتی: قورئان وتەی خواوەندە، ئەگەر سەروەری باوەڕداران فەرمان بدات، گوێڕایەڵ دەبین و ملکەچی خۆمان نیشان دەدەین. ئیسحاق بەدەبیری وت: وتەکانی بنووسە.

ئیسحاق ئەم پرسیارەی لەعەلی کوڕی باوکی موقاتیل کرد و هەمان وەڵامی بیست. دواتر ئیسحاق رووی کردە باوکی حەسانی زیادی و وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟ وتی: هەرچی دەخوازیت، بپرسە. ئیسحاق نامەکەی مەئمونی بۆ خوێندەوە و ئەو نوسراوی ناو نامەکەی پشت راست کردەوە و بەدوایدا وتی: هەرکەس باوەڕی بەمە نەبێت، باوەڕی بەخوا نییە. ئیسحاق پرسی: ئایا قورئان ئافرێنراوە؟ لەوەڵامدا وتی: قورئان فەرموودەی خواوەندە و خواوەند ئافرێنەری هەموو شتێك و هەموو دیاردەییێکە و سەروەری باوەڕداران پێشەوای ئێمەیە و ئەو زانستی فێری ئێمە کردووە وئەوەی بیستووە کەئێمە نەمان بیستووە و لەو بابەتانە ئاگادار بۆتەوە کەئێمە ئاگادار نین و خواوەند کاروباری ئێمەی بەو سپاردووە. ئەو سەرپەرەستی حەج و نوێژی ئێمە دەکات و زەکاتی سامانی خۆمان بەو دەدەین و لەگەڵ ئەو بەشداری جیهاد دەبین. باوەڕمان بەپێشەوایەتی ئەو هەیە، ئەگەر فەرمان بدات، ملکەچی فەرمانەکانی دەبین و ئەگەر رێگەمان لێ بگرێت، گوێرایەڵین.

باوکی حەسان لەئیسحاقی پرسی: ئایا قورئان ئافرێنراوە؟ دووبارە پرسیارەکەی کردەوە. ئیسحاق وتی: ئەمە پرسیاری سەروەری باوەڕدارانە. باوکی حەسان وتی: ئایا باوەڕی خۆی بەو شێوەیە بەڵام فەرمان بەخەڵکان نادات، ئەگەر بەمن بڵێی سەروەری باوەڕداران فەرمانی بەتۆداوە من بەو شێوەیە قسە بکەم، ئەوەی بیهێنیتە سەرزمان، دەیهێنمە سەرزمان چوونکە تۆ کەسێکی بڕواپێکراویت. ئیسحاق وتی: سەروەری باوەڕداران هیچ فەرمانێکی بەمن نەداوە بەتۆی بڵێم. باوکی حەسان وتی: تەنیا بیستن و فەرمانبردن لەمن دەوەشێتەوە، فەرمان بدە تا جێبەجێی بکەم. ئیسحاق وتی: فەرمانی بەمن نەداوە فەرمان بەئێوە بدەم، تەنیا فەرمانی داوە تاقیتان بکەمەوە.

ئیسحاق بەئەحمەد کوڕی حەنبەلی وت: بۆچوونی تۆ سەبارەت بەقورئان چییە؟ وتی: فەرموودەی خواوەندە.؟ ئیسحاق پرسی: ئایا ئافرێنراوە؟ ئەحمەد وتی: فەرموودەی خواوەندە و هیچی دیکەم نییە. ئیسحاق هاوشێوەی نامەکە ئەزمونی کرد. کاتێك گەیشتە ئەم فەرموودەی پەروەدگار کەدەفەرمێت: ((لیس کمثله شیء و هو السمیع البصیر)) ئەحمەد لەوتنی ئەم وتەیە خۆی بەدوور گرت کە: ((لا یشبهه

شیء من خلقه فی معنی منن المعانی و لا وجه من الوجوه)) (هیچ کام لەئافرێنراوەکان بەهیچ مانایەك و بەهیچ جۆرێك هاوشێوەی ئەو نین.)) کوڕی بەکای ئەسغەر رەخنەی لێگرت و وتی: خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە، ئەو دەڵێت، بەگوێ دەبیستێت و بەچاو دەبینێت. ئیسحاق بەئەحمەدی وت: مانای (سمیع بصیر) کامەیە؟ ئەحمەد وتی: ئەوەیە خواوەند فەرموویەتی. ئیسحاق وتی: ماناکەی چییە؟ ئەحمەد وتی: من نازانم ئەوەیە یا نا بەڵام ئەوەیە کەخۆی، خۆی وەسف کردووە؟

ئیسحاق یەك یەك زاناکانی بانگ کرد. هەمووان قورئانیان بەفەرموودەی خواوەند زانی جگە لەقوتەیبە و عوبەیداللە کوڕی محەممەد کوڕی حەسەن و کوڕی عولییەی ئەکبەر و کوڕی بەکار و عەبد ئەلمونعیم کوڕی ئیدریس کوڕی بینت و وەهب کوڕی مونەبە و موزەفەر کوڕی مەرجی و پیاوێك لەرەگەزی عومەر کوڕی خەتاب کەدادیاری رەققە بوو لەگەڵ کوڕی ئەحمەر. کوڕی بەکای ئەکبەر وتی: قورئان دانراوە چوونکە خواوەند دەفەرمێت: ئێمە قورئانمان بەعەرەبی داناوە.[٩] بەهەمان شێوە کەقورئان موحەدیسە چوونکە دەفەرمێت: هیچ پەندێکی تازە لەلایەن پەروەردگاریانەوە نەهات.[١٠]

ئیسحاق وتی: دانراوە، ئافرێنراوە. کوڕی بەکا وتی: بەڵێ. ئیسحاق وتی: کەواتە قورئان ئافرێنراوە. کوڕی بەکا وتی: من نەموت: ئافرێنراو، وتم: دانراو. وتەکانی نوسرایەوە. هەرکەس هەرچی وت: نووسرا و نوسراوەکان بۆ لای مەئمون رەوانە کرا. مەئمون لەوەڵامدا ئەوانی سەرکۆنە کرد و بەنەزان و بێ ئەزمونی لەقەڵەمدان. مەئمون فەرمانیدا بیشر کوڕی وەلید و ئیبراهیم کوڕی مەهدی ببەنە لای تا ئەزمونیان بکات. مەئمون پەیمانی بەست ئەگەر وەڵامیان دایەوە، چ باشتر و گەرنە هەردووکیان دەکوژێت و ئەگەر ئەم دوانە شایەتییان بۆ ئافراندنی قورئاندا کەهیچ و گەرنە قۆڵبەست کراو لەگەڵ پاسەوانەکان بۆ ئوردووگایان دەنێرن.

ئیسحاق هەموویانی کۆکردەوە و لەمەبەستەکەی مەئمون ئاگاداری کردنەوە.

---

[٩] (زخرف) انا جعلناه قرآنا عربیا

[١٠] انبیاء (ما یأتیهم من ذکر من ربهم محدث)

هەمووان رازی بوون بەوەی بڕۆنە بارەگای مەئمون جگە لەچوار کەس: ئەحمەد کوڕی حەنبەل، سوبجادە، قەواریری و محەممەد کوڕی نوحی مەزروب.، ئیسحاق فەرمانیدا زنجیر لەدەست و پێیان بکەن. بۆ بەیانی، دووبارە ئەو چوار کەسەی بانگ کردەوە و سەر لەنوێ پرسیاری لێکردن. سوبجادە و قەواریری وتەکانیان پشتراست کردەوە بەڵام ئەحمەد کوڕی حەنبەل و محەممەد کوڕی نوح پێداگرییان لەسەر وتەکانی خۆیان کرد و دووبارە قۆڵبەست کران. ئەم دوانە رەوانەی بارەگای مەئمون لەتەرسوس کران. ئیسحاق وەڵامی ئەو دەستەی بۆ مەئمون ڕەوانە کرد. مەئمون لەوەڵامدا نووسی: ئاگادار بوومەوە بیشر کوڕی وەلید لەشرۆڤە کردنی ئەم ئایە ( مەگەر ئەو کەسەی ناچار بکرێت و دڵی بەئیمان ئاسوودە بێت[11])) بەلارێدا ڕۆشتووە. چوونکە مەبەستی خواوەند لەم ئایە کەسێکە دڵی لێوانلێو لەئیمان بێت و ناباوەڕی پشتگوێ بخات بەڵام ئەو کەسەی باوەڕی بەناباوەڕی هەبێت و ئیمان پشتگوێ بخات، ئەم ئایە نایگرێتەوە.

ئیسحاق ئەوانی بۆ تەرسوس ڕەوانە کرد تا لەکاتی گەڕانەوەی سەروەری باوەڕداران لەرۆم لەوێ بمێننەوە. ئیسحاق ئەوانی کۆکردەوە و ڕەوانەی ئوردووگاکەی کردن. ئەم کەسانە بوون: باوکی حەسانی زیادی، بیشر کوڕی وەلید، فەزڵ کوڕی غانم، عەلی کوڕی موقاتیل، زەیال کوڕی هەیسەم، یەحیا کوڕی عەبدولرەحمانی عومەری، عەلی کوڕی جەغد. باوکی عەوام، سوبجادە، قەواریری، باوکی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی عاسم، ئیسحاق کوڕی باوکی ئیسرائیل، نەزر کوڕی شومەیل، باوکی نەسری تەمار، سەعدویەی واستی، محەممەد کوڕی حاتەم کوڕی مەیمون، باوکی مەعمەر کوڕی هەرش، باوکی فەرحان، ئەحمەد کوڕی شوجاع و باوکی هارون کوڕی بەکا. کاتێك گەیشتنە رەققە، هەواڵی مەرگی مەئمونیان بیست و رێگەی بەغدادیان گرتەبەر.

---

[11] نحل/ ١٠٦: الا من اكره و قلبه مطمئن بالايمان.

## نەخۆشی و وەسیتنامەی مەئمون

لەم ساڵەدا مەئمون نەخۆش کەوت و بەهۆیەوە لەسیانزەی جومادی الاخر/ ٥ ژانویە، مرد. چۆنیەتی نەخۆشییەکەی ئەو بەهەمان شێوە کەسەعد کوڕی عەلاف قاری دەڵێت، بەمشێوە بووە:

ڕۆژێك مەئمون لەکەنارەکانی بەزەندون[١٢] دانیشتبوو، منی بانگ کرد. موعتەسەم لای ڕاستی دانیشتبوو و هەر دوو قاچی خستبووە ناو ئاوەکە. فەرمانی بەمندا دوو قاچم بخەمە ناو ئاوەکە و وتی: لەم ئاوە بخۆرەوە و پێم بڵێ ئایا بەتامتر لەم ئاوەم خواردۆتەوە یا نا یا ئاوێکی جوانتر و فێنکتر لەو ئاوەت ڕژاندۆتە ناو قورگت؟ ئەو کارەم کرد و وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران تا ئێستا ئاوێکی لەو شێوەم نەبینیوە. مەئمون وتی: دەتوانین چی بخۆین و ئەم ئاوەی بەدوادا بخۆینەوە؟ وتم: سەروەری باوەڕداران باشتر دەزانێت. وتی: خورمای ئازاد( جۆرێکە لەخورمای بەناو بانگی ئەو سەردەمە)

سەرقاڵی ئەم گفتوگۆیە بووین لەناکاو دەنگی سمی چوارپێکانی بەرید بەگوێ گەیشت. کاتێك مەئمون سەیری کرد، ئێسترەکانی بینی کەسنوقی دیارییەکانیان بار کردبوو. لەم کاتەدا بەخزمەتکارەکەی وت: بزانە ئەگەر خورمای ئازاد لەناو دیارەکاندا بوو، بیهێنە. ئەو ڕۆشت و دوو سەوەتە خورمای ئازادی لەگەڵ خۆی هێنا، دەتوت تازە لەدار کراونەتەوە. مەئمون سپاسی خواوەندی کرد. هەموان سەرمان سوڕما و لەخورماکەمان خوارد و بەدوایدا لەئاوی بەزەندونمان خواردەوە. هێشتا کەس هەڵنەستابوو، مەئمون گرفتاری تا بوو و دەرئەنجامی ئەم تایە، کۆچی دوایی کرد. موعتەسەمیش نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی تا گەیشتن بەعێراق درێژەی کێشا. منیش تا ماوەیەك نەخۆش بووم.

کاتێك مەئمون نەخۆش کەوت، فەرمانیدا لەبەندەی خوا مەئمون، سەروەری باوەڕداران نامەیەك بۆ هەموو سەرزەمینە ئیسلامییەکان بنێرن. فەرمانیدا نامەیەك بۆ جێگرەکەی، یانی براکەی باوکی ئیسحاق کوڕی هارون ڕەشید بنووسین. دواتر بەئامادەبوونی عەباسی کوڕی، فەقیهەکان، داوەرەکان، سەرکردەکان لای

---

[١٢] لەومێژووی تەبەری بە بەدەندون هاتووە. (وەرگێر)

موعتەسەمی برای وەسیەتی کرد. وەسیەتی ئەو دوای شایەتی و دان نان بەتاقانەیی خواوەند و رۆژی پەسلاّن و بەهەشت و دۆزەخ و ناردنی درود بۆ پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەران بەم شێوە بوو:

گوناحکارێکی هیوادارم کەتەنیا لەکاتی بیرهێنانەوەی بەخشینی خواوەند، ئومێد لەناخمدا بلێسە دەستێنێت. ئەو کاتەی مردم، رووم بەرەو قیبلە بسورێنن و چاوەکانم ببەستن و بەجوانی غوسلّم بکەن و بەکفنێکی جوان، کفنم بکەن. بەردەوام وەسفی خواوەند بکەن بۆ ئەوەی ئیسلامی وەك دیاری بەئێمە بەخشی و ئێمەی خستە ریزی ئۆمەتەکەی خۆی کەداوای بەخشینمان بۆ دەکرێت. دواتر بمخەنە ناو گۆڕ و لە بەخاك سپاردنی من بەپەلە بن. کەسێك نوێژ لەسەر من بخوێنێت کە لەهەمووان بەمن نزیکتر و بەتەمەنتر بێت. دەبێت لەنوێژەکەی پێنج جار تەکبیر بلێت و دواتر بەخاکم بسپێرن. کەسێك بێتە ناو گۆڕەکەم کە لەهەمووان بەمن نزیکتر بێت و زیاتر لەهەر کەسێك منی خۆش بوێت.

بەردەوام وەسف و سپاسی خواوەند بکەن، دواتر لەسەر لای راست و روەو قیبلە بمخەوێنن و کفن لەسەر و پێم بکەنەوە. دواتر گۆڕەکە داپۆشن و من و کردەوەکانم بەجێبێلّن چوونکە کەس لەئێوە ناتوانێت نیازێکی من بەدی بێنێت و ناشادومانی لەمن دوور بکاتەوە. هەمووتان بێستن و ئەگەر چاکەکاری منتان لەبیرە، بیهێننە سەرزمان و ئەگەر خراپەکانی منتان لەبیرە، بێدەنگ بن چوونکە لەناو ئێوەدا دەڕۆم لەکاتێکدا گرفتاری وتەی ئێوەم. رێگە مەدەن کەس بۆ من فرمێسك لەچاو ببارێنێت چوونکە ئازابەکانی ئەو کەسەی بۆی دەگرین، زیاد دەکات. خواوەند ببەخشێت ئەو بەندەی وانە وەردەگرێت و بیر لەمردنی خۆی بکاتەوە. بیر کردنەوە لەمەرگێك کەهیچ رێگە چارەیەکی نییە. سپاس بۆ ئەو خوایەی نەمرە و مردنی لەسەر هەموو ئافرێنراوەکانی داناوە.

هەموان ببینن ئایا رێزداری فەرمانڕەوایی لەکاتی هاتنی فریشتەی مەرگ، هیچ سوودێکی بەمن بەخشی، سوێند بەخوا نە، تەنیا باری سەرشانی منی قورستر کرد. خۆزگە عەبدوالله کوڕی هارون (ناوی مەئمون) مرۆڤ نەدەبوو و هیچ کات چاوی بەدنیا هەڵنەدەهات.

ئەی باوکی ئیسحاق وەرە پێش و لەوەی دەیبینی، وانە وەربگرە. لەقورئان و ئیسلام ڕێچکەی براکەت بگرەبەر. ئەو کاتەی خواوەند تەوقی خەلافەت دەکاتە ملی تۆ، بەشێوەیەك کاروبارەکان بەڕێوەببە وەك بڵێی خواپەرەستێکی لەسزاکانی ئەو دەترسیت. لەوەی خواوەند دەرفەتت پێ دەدات. یاخی مەبە و گومان بکە فریشتەی مەرگ بەردەوام لەسەر سەری تۆیە. بۆ چارەسەری کارو کێشەی خەڵکان و ژێر دەستان هەوڵ بدە چوونکە فەرمانڕەوایەتی تۆ بەندە بەئەنجامدانی ئەو کارانە. خواوەندا، لەناو ئەم موسوڵمانانە ئاشتی و چاکەکاری فراوان بکە.

ماف ناتەواوان لە بەتواناکان وەربگرە و هیچ شتێك بەسەر خەڵکان مەسەپێنە و دادی ئەوان لەسەر بنەمای ڕاستی لەیەکتر وەربگرە. خەڵکان لەخۆت نزیك بکەرەوە و بەشێوەیەکی نەرم لەگەڵیان مامڵە بکە. لێرە بڕۆ و بەخێرایی خۆت بەپایتەختی ئیسلامی لەعێراق بگەیێنە. بەردەوام بیر و لێکۆڵینەوە لەکاری خەڵکان بکە و هیچ کات لێیان بێ ئاگا مەبە. بەشێوەیەکی بەبڕشت و جیدی شەڕ لەگەڵ خوڕەمییەکان بکە و هاوکاری لەسوپا و توێشوی سوپا وەربگرە و ئەگەر جەنگ دژی ئەوان درێژەی کێشا، لەگەڵ کەسان و هاوەڵانی خۆت بۆ جەنگی ئەوان بڕۆ. ئەم کارە لەڕێگەی خواوەند ئەنجام بدە و چاوەڕوانی پاداشتی خوایی بە.

دوای کاژێرێك کەئازار زیادی کرد و بانگی فریشتەی مەرگی بیست، موعتەسەمی بانگ کرد و وتی: ئەی باوکی ئیسحاق، بەپەیمانی خواوەند و خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) سوێندت دەدەم ڕاستیی و ماف لەناو خەڵکان سەقامگیر بکەیت و فەرمانبردن لەفەرموودەکانی خواوەند پێش هەر شتێکی دیکە بخەیت چوونکە خەلافەتم لەجیاتی کەسێکی دیکە بەتۆ سپارد. موعتەسەم وتی: سوێند بەخوا بەدڵی تۆ دەبێت. مەئمون وتی: کوڕە مامەکانی تۆ لەمناڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبن، بەردەوام هاونشینی ئەوان هەڵبژێرە و لەخراپەکارەکانیان خۆش ببە و بەکاری چاکەکارانیان ڕازی ببە و ساڵانە دیاری وپاداشتیان بۆ بنێرە ولێیان بێ ئاگا مەبە. بۆ ڕەزامەندی خواوەند تێبکۆشن و هاوشێوەی موسوڵمان بمرن. لەخواوەند بترسن و بۆ ڕەزامەندی ئەو بەڕێگەدا بڕۆن. خۆم و ئێوە بەخوای گەورە دەسپێرم. بۆ گوناحەکانی ڕابردووم داوای بەخشین لەخوا دەکەم چوونکە

ئەو بەخشەرە و دەزانێت کەپەشیمانم. لەگوناحە گەورەکان پشت بەخوا دەبەستم و تۆبە بۆ بارەگای ئەو بەرز دەکەمەوە. هیچ هێزێك نییە مەگەر تایبەت بەخوا بێت. خواوەند بۆ من بەسە. سلاوی خواوەند لەمحەممەدی پێغەمبەر(د.خ) و ڕێنیشاندەر.

## مەرگی مەئمون، تەمەن و تایبەتمەندییەکانی ئەو

مەئمون لەهەژدەی مانگی ڕەجەبی ئەم ساڵە مرد. کاتێك نەخۆشییەکەی تەشەنەی سەند و کاتی مەرگی نزیك بوویەوە، کەسێکی لابوو کەتەلقینی کرد و شایەتومانی بۆ هێنایە سەرزمان. کوڕی عاسویەی پزیشك لەوێ بوو. کوڕی ماسویە بەو کەسەی وت: وازی لێ بێنە چیتر لەنێوان خواوەند و مانی دوو لایەنی هەڵنابژێرێت. مەئمون دوو چاوی خۆی کردەوە و ویستی سەرکۆنەی بکات بەلام نەیتوانی، ویستی شتێك بڵێت بەلام نەیتوانی، تەنیا وتی: ئەی ئەو کەسەی نامریت، ئەو کەسەی دەمرێت، بیبەخشە.

کاتێك مەئمون مرد، عەباسی کوڕی و موعتەسەمی برای، جەنازەی ئەویان بۆ تەرسوس برد و لەماڵی خاقان خزمەتکاری ڕەشید بەخاکیان سپارد. موعتەسەم نوێژی لەسەر خوێند و پاسەوانەکان لەتەرسوسییەکان و کەسانی دیکە کەژمارەیان دەگەیشتە سەد کەس، پاسەوانی گۆڕەکەیان کرد وهەر کام نەوەد درهەمیان وەرگرت.

مەئمون بیست ساڵ و پێنج مانگ و بیست و سێ ڕۆژ خەلافەتی کرد جگە لەو ساڵانەی ئەمیر لەبەغداد گەمارۆی خرابوویە سەر و لەمەککە ناوی ئەویان وەك خەلیفە دەبرد. ئەو لەنیوەی ڕەبیع الاوەلی ساڵی ١٧٠ کۆچی/ ١٣ سێپتامبەری ٧٨٦ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. نازناوەکەی باوکی عەباس بوو. چوارشانە، سپی و قۆز بوو، ڕیشی تەنك و درێژ و بەشێکی سپی ببوو. دەڵێن: گەنم ڕەنگ و زەردی بەروخسارییەوە دیار بووە. چاوەکانی ڕەش، ناوچاوی تەسك و خاڵێکی ڕەش بەروخساریەوە بوو.

## بەشێك لەکار و کردەوەکانی مەئمون

محەممەد کوڕی ساڵحی سەرەخسی دەڵێت: پیاوێك لەشام چەند جارێك لەسەر ڕێگەی مەئمون وەستا و پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەشێوەیەك سەیری

عەرەبەکانی شام بکە کەسەیری عەجەمەکانی خوراسان دەکەیت. مەئمون پێی وت: چەندە ئەم وتەیەت دووبارە کردەوە. سوێند بەخوا من هۆزی قەیسم لەپشت ئەسپەکان نەهێنایە خوار مەگەر ئەو کاتەی گەنجینەکەم درهەمی تیا نەما (یانی فیتنەکەی کوڕی شەبەسی عامر) بەلاّم سوێند بەخوا یەمانییەکانم خۆش ناوێت چوونکە ئەوانیش منیان ناوێت؛ بەلاّم سەرکردەکانی قوزاعە بەردەوام چاوەڕوانی سوفیانی[١٣] دەکەم تا شوێنی کەون، خەڵکانی رەبیعە لەخواوەندێك توڕەن کەپێغەمبەرەکەی لەناو مسرییەکان هەڵبژارد و هیچ دوو کەسێك ناڕۆنەدەر مەگەر ئەوەی یەکێکیان دەبێت شاری (نەفسی خۆی لەرێگەی خوادا فرۆشتبێت) بێت. کەواتە رێگەی خۆت بگرە بەر و بزانە خواوەند چ بەلاّیەکی بەسەردا هێناویت (یانی تۆ لەعەرەبەکانی و خواوەند عەرەبەکانی گرفتاری توڕەیی خۆی کردووە، گلەیی و گازندە لەمن مەکە).

سەعید کوڕی زیاد دەڵێت: کاتێك لەدیمەشق ڕۆشتمە لای مەئمون، وتی: ئەو نامەی پێغەمبەر(د.خ) نووسیویەتی، نیشانم بدە. سەعید دەڵێت: نامەکەم نیشاندا، مەئمون وتی: دەمەوێت بزانم پۆششی ئەم ئەنگوستیلە چییە؟ سەعید دەڵێت: موعتەسەم وتی: گرێکە بکەرەوە تا بزانیت. مەئمون وتی: گومانم نییە کە پێغەمبەر(د.خ) ئەم گرێی لێداوە و من ئەو گرێی پێغەمبەر(د.خ) لێیدابێت، نایکەمەوە. دواتر بەواسقی وت: نامەکە بگرە ( پێم وابێت پەیمان نامەی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ مەسیحییەکان بووبێت کە بەهۆیەوە کەس نەدەبوا ئازاری مەسیحییەکان بدات بەلاّم موعتەسەم بەدرۆینەی لەقەڵەم دەدا چوونکە مەئمون گومانی لەمۆری پێغەمبەر(د.خ) کردبوو) و بیخە سەرچاوت، ئەگەری هەیە خواوەند شیفات بدات. دواتر خۆی خستیە سەرچاوی و دەستی بەگریان کرد.

عیشا (عیسا) هاورێی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: لەدیمەشق هاورێیەتی مەئمونم دەکرد. لەم کاتەدا بەرادەیەك ماڵ و منالّەکەی کەمی کردبوو کەگرفتاری هەژاری بوو و لای موعتەسەم سکالاّی بەرز کردەوە. موعتەسەم پێی وت: ئەی

---

[١٣] شۆڕشگێڕێکی ئومەوی لەدیمەشق کە لەکاتی ناسازگاری مەئمون و ئەمین پێشنیاری بەیعەتی خۆی بەخەڵکان دەکرد. کوڕی بەیهەس کۆتایی بەشۆڕشەکەی هێنا.

سەروەری باوەڕداران خۆڕاگر بە چوونکە هەیبی سامانت بەدەست دەگات. سێ هەزار هەزار درهەم لەباجی ئەو ویلایەتی موعتەسەم لەلایەن مەئمونەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرد، ڕەوانە کرابوو. کاتێك سامانەکە گەیشت، مەئمون بەیەحیا کوڕی ئەکسەمی وت: بڕۆین و سەیری ئەم برە پارەیە بکەین. ڕۆشتن و گەیشتنە سارا و سەیری پارەکەیان کرد. پارەکان بەشێوەیەکی زۆر باش بەستەبەندی کرابوون، رووکەشەکانیان رازاوە و بەپەشمی رەنگین داپۆشرابوون. مەئمون خۆشحاڵ و ژماردی. خەڵکان هاتبوون و سەیریان دەکرد و لەبینینی، سەریانسوڕما. مەئمون بەیەحیای وت: ئەی باوکی محەممەد، ئایا ڕەوایە هەنووکە هاورێیانی ئێمە بێ هیوا بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و ئێمە تەنیا ئەم پارانە ببەین. ئەمە پەستییە. محەممەد کوڕی یەزدادی بانگ کرد و پێی وت: بۆ فلاّن بنەماڵە هەزار هەزار درهەم بنووسە، بۆ فلاّن ئەوەندە، و بۆ ئەو بنەماڵەی دیکە، هاوشێوەی ئەوان. عیشا دەڵێت: مەئمون لەهەمان کات کەسوار لەسەر ئەسپ بوو بەرادەیەك پارەی بەخشییەوە کەبڕی پارەی ماوە گەیشتە بیست و چوار هەزار درهەم. وتی: ئەوەی ماوە، تەسلیمی موعەلی بکە تا لەنێوان سوپاییەکان دابەشی بکات.

عیشا دەڵێت: لەبەر چاوی هەستام، سەیری مەئمون و دەبیرەکەیم دەکرد، کاتێك منی بینی، وتی: پەنجا هەزار درهەم بۆ ئەویش بنوسە، من برە پارەکەم وەرگرت.

محەممەد کوڕی ئەیووب کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمان دەڵێت: لەبەسرە پیاوێك لەمناڵەکانی تەمیم کوڕی سەعد دەژیا، شاعیرێك بوو قسەخۆش بەلاّم خراپەکار و نابەکار. هاودەمی ئێمە بوو و حەزمان بەدانیشتنی ئەو دەکرد. رۆژێك پێم وت: تۆ شاعیرێکی زمان پاراویت، مەئمون لەهەوری باراناوی بەخشندەترە، بۆ ناڕۆیتە لای؟ وتی: هەزینەی ڕۆشتن بۆ لای ئەوم نییە. پێم وت: چوارپێ و خەرجی ڕێگەت لەئەستۆی من. چوارپێ و سێسەد درهەمم پێدا. ئەویش هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و ڕێگەی بارەگای مەئمونی گرتەبەر.

خۆی دەڵێت: لەسەلغوس ڕۆشتمە لای مەئمون. جل و بەرگی تازەی خۆم لەبەر کرد و ڕێگەی لەشکرگەم گرتەبەر، لەناکاو پیاوێکی چوارشانەم لەسەر ئێستر بینی. ئەویش منی بینی کەهۆنراوەکەم لەبەردەم خۆمەوە دەوتەوە. وتی: سلاّوت لێ بێت.

وتم: سلاو و ڕەحمەتی خواوەند لەتۆ بێت. وتی: ئەگەر دەتەوێت، بێستە، وەستام. بۆنی موشك و عەنبەری لیّ دەهات. وتی: لەکام خەڵکیت؟ وتم: پیاوێك لەموزێر. وتی: ئێمەیش لەموزێرین. وتی: لەکام هۆزیت؟ وتم: منالەکانی تەمیم. وتی: لەکام دەستە لەمنالەکانی تەمیم؟ وتم: منالەکانی سەعد. وتی: بۆ هاتوویت بۆ ئێرە؟ وتم: دەمەوێت سەروەری باوەڕداران ببینم چوونکە بەخشندە و بەخشەرە. وتی: هۆکاری تۆ بۆ بینینی ئەو چییە؟ وتم: هۆنراوەیەکی جوانم هۆنیوەتەوە و دەمەوێت بیبیستێت. وتی: بۆ منی بخوێنەرەوە. تورە بووم و وتم: ئەی بیّ مێشك، هۆنراوەیەکم بۆ وەسفی خەلیفە هۆنیوەتەوە و تۆ داوا دەکەی بۆ تۆی بخوێنمەوە. گرنگی بەوتەکەم نەدا و وەلامی نەدامەوە. وتی: هیواداری بەهۆی ئەم هۆنراوە چیت دەست کەوێت؟ وتم: ئەگەر بەو شێوە بێت کەبیستوومە، هەزار دینار. وتی: ئەگەر هۆنراوەکەت پەسەند بکەم، هەزار دینارت پیّ دەدەم و دژواری گەیشتن بەخەلیفەت لەکۆڵ دەکەمەوە و مۆڵەتت بۆ وەردەگرم، خەلیفەیەك کەدەهەزار ڕم بەدەست لەنێوان ئەو و تۆدا جێگیرە. وتم: خواوەند شایەت بێت؟ وتی: بەلیّ، خواوەند شایەت بێت. هۆنراوەکەم بۆ خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| مأمون یا ذا المنن الشریفه | و صاحب المرتبة المنیفه |
| و قائد الکتیبة الکثیفه | هل لك فی ارجوزة ظریفة |
| اظرف من فقه ابی حنیفه | لا والذی انت له خلیفه |
| ما ظلمت فی ارضنا ضعیفه | امیرنا مؤنته خفیفه |
| و ما اقتنی شیئا سوی الوظیفه | فالذئب و النعجة فی سقیفه |

و اللص و التاجر فی قطیفه

واتاکەی: مەئمون، ئەی هەڵگری پێگە بەرز و لەپێشەکان و سەرکردەی سوپا فراوانەکان. ئایا هۆنراوەیەکی پەسەند و جوان دەخوازیت جوانتر و پەسەندتر لەفیقهی باوکی حەنیفە، سوێند بەو کەسەی تۆ جێگری ئەویت، هیچ ناتەوانێك لەسەرزەمینەکەی ئێمە ستەمی لیّ نەکراوە. خەرجی پاشاکەی ئێمە کەمە و جگە لەمانگانەی خۆی هیچ پاشەکەوت ناکات. گورگ و مەڕ لەژێر یەك سەقفدا دەژین و دز و بازرگان لەیەك جل و بەرگدان.

دەڵێت: سوێند بەخوا کاتێك گەیشتمە ئەم دێرەی هۆنراوەکەم، لەناکاو نزیکەی دەهەزار شاسوار ڕێگەی ئاسۆیان گرت و یەکدەنگ هاواریان کرد: سلاْوی خواوەند لەتۆ بێت ئەی سەروەری باوەڕداران. دەڵێت: کەوتمە لەرزین، کاتێك منی لەم حاڵەدا بینی، وتی: برام، نیگەران مەبە. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، کام خەڵکە لەعەرەبەکان (کاف) یان لەجیاتی(قاف) بەکار برد؟ وتی: حەمیرییەکان. وتم: نفرینی خواوەند لەحەمیرییەکان و نفرین لەو کەسەی چیتر ئەم زاراوە بەکار دەبات.

مەئمون پێکەنی و بەخزمەتکارەکەی وت: هەرچیت پێیە، بەو پیاوەی بدە. کیسەیەکی دەرهێنا، سێ هەزار دیناری پێ بوو. پارەکانم وەرگرت و گەڕامەوە.

مانای پرسیاری ئەو لە (کاف) و (قاف) ئەوە بوو کەدەیویست بڵێت: ئەی (رقیق) بەلاْم ئەی (رکیك)ی هێنایە سەرزمان.

عومارە کوڕی عوقەیل دەڵێت: هۆنراوەیەکی سەد دێریم بۆ مەئمون هۆنییەوە. هەر دێرێکم دەستپێدەکرد، پێشتر قافیەکەی دەوت (بەهەمان شێوەی خۆم) وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەخوا ئەم هۆنراوەم بۆ کەس نەخوێندۆتەوە. وتی: ڕاست دەکەیت. وتی: ئایا نەتبیستووە عومەر کوڕی باوکی ڕەبیعە هۆنراوەکەی خۆی بۆ عەبدوالله کوڕی عەباس خوێندەوە: تشط غدأ دار جیراننا و کوڕی عەباس دێری دووەمی بۆ خوێندەوە: و للدار بعد غد ابعد. دواتر قافیەکانی تا کۆتایی هۆنراوەکە وت، وتی: من کوڕی ئەوم.

دەگێڕنەوە مەئمون وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| بعثتك مرتادا ففزت بنظرة | و اغفلتنی حتی اسات بك الظنا |
| فنا جیت من اهوی و کنت مباعدا | فیالیت شعری عن دنوك ما اغنی |
| اری اثرا منه بعینیك بینا | لقد اخذت عیناك من عینه حسنا |

واتاکەی: تۆم بۆ گەڕان نارد کەنیگایەك بوو بەبەشی تۆ و بەرادەیەك لەمن بێ ئاگا بوویت کە گومانم لەتۆ کرد. لەگەڵ دولبەرەکەی من بەهێواشی قسەت کرد و من دوور بووم. خۆزگە دەمزانی نزیك بوونەوەی تۆ هۆکاری چییە؟ نیشانێکی ئاشکرا لەو لەچاوەکانی تۆ دەبینم. چاوەکانت جوانی لەچاوەکانی ئەو بەقەرز وەرگرتووە.

دەگێڕنەوە مەئمون لەم هۆنراوەی خۆی لەم مانایە پشتی بەوتەی عەباس کوڕی ئەحنەف بەستووە:

ان تشق عینی بها فقد سعدت　　عین رسولی و فزت بالخبر

و کلما جاءنی الرسول لها　　رددت عمدا فی عینه نظری

خذ مقلتی یا رسول عاریة　　فانظر بها و احتکم علی بصری

واتاکەی: ئەگەر چاوەکانم لەو بەدبەخت بێت، چاوی نێردراوەکەم بەختەوەرە، هەرکات نێردراوێك ڕۆشتبێتە لای، بەئەنقەست چاو دەبڕمە چاوی چوونکە جوانییەکانی ئەو لەروخساری دیارە. ئەی نێردراو! چاوەکانی من بەقەرز وەربگرە و بەچاوی من بڕوانە و بەچاوی من داوەری بکە.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك یەزیدی سکاڵای قەرزەکەی خۆی بردە لای مەئمون. مەئمون وتی: لەئێستادا پارەم نییە و ناتوانیت بەمەبەستەکەی خۆت بگەیت. یەزیدی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خاوەن قەرزەکان تەنگیان پێ هەڵچنیوم. مەئمون وتی: لەدەوروبەری خۆت بگەڕێ ئەگەری هەیە سوودێك بەدەست بێنیت. یەزیدی وتی: چەندین هاونشینت هەیە و ئەگەر تەنیا یەکیان هان بدەیت، هاوکاری من دەکات. یەزیدی وتی: کاتێك هەموان هاتن و هاونشینەکانی تۆ هاتن، بەفلان خزمەتکار بڵێ نامەکەی من بەتۆ بگەیێنێت. کاتێك خوێندتەوە، پەیام بەمن بدە چوونکە لەم کاتەدا هاتنە ژوورەوەی تۆ ئەگەری نییە، بەڵام هەر کەسێك دەخوازی بۆ هاونشینی خۆت هەڵیبژێرە.

کاتێك یەزیدی ئاگادار بوویەوە مەئمون دانیشتووە و هاونشینەکانی لەدەوری کۆبوونەتەوە و دڵنیابوو لەوەی سەریان گەرمە، ڕۆشتە پێش و نامەکەی تەسلیمی خزمەتکارەکە کرد تا تەسلیم بەمەئمونی بکات. ناوەڕۆکەکەی ئەمە بوو:

یا خیر اخوانی و اصحابی　　هذا الطفیلی علی الباب

خبر ان القوم فی لذة　　یصبو الیها کا اواب

فصیرونی واحدا منکم　　او اخرجوا لی بعض اترابی

واتاکەی: ئەی باشترینی براکان و هاورێیانی من، هەنووکە توفەیلی لەبەردەم دەرگا وەستاوە، ئەو ئاگادار بۆتەوە کەخەڵکان شادی دەگێڕن بەشێوەیەك هەر

کەسێك خوازیارە پێی، من بکەنە هاونشینی خۆتان یا کەسێك لەخۆتان بۆ لای من بنێرن.

مەئمون نامەکەی بۆ ئامادە بوان خوێندەوە، وتیان: ڕەوا نییە کوڕی توفەیلی لەم کاتەدا بێت. مەئمون پەیامی بۆ ناردم: لەم کاتەدا هاتنی تۆ بۆ ئەم دانیشتنە شیاو نییە، هەرکەسێك دەخوازی وەك هاونشینی خۆت هەڵیبژێرە. یەزیدی وت: جگە لە عەبدوالله کوڕی تاهیر کەس هەڵنابژێرم. مەئمون بە عەبدوالله کوڕی تاهیری وت: ئەو تۆی هەڵبژاردووە، بڕۆ بۆ لای ئەو. عەبدوالله وتی: کەواتە من شەریکی توفەیلی بم. مەئمون وتی: باوکی محەممەدی توفەیلی تەنیا بەدوو شت دەتوانین دووری بکەینەوە، یا بڕۆ لای یا بەهاکەی بدە. تاهیر وتی: سەروەری باوەڕداران، دە هەزار درهەمی پێ دەدەم. مەئمون وتی: گومان ناکەم بەم بڕە دەست لەهاونشینی تۆ هەڵبگرێت. تاهیر بەهەمان شێوە دە هەزار دە هەزار زیادی دەکرد و مەئمون دەیوت: ئەم پارەیە رازی ناکات تا گەیشتە سەد هەزار. مەئمون وتی: هەرچی زووتر ئەم بڕە پارەی پێبدە. تاهیر بەرگەیەکی بۆ نوێنەرەکەی نووسی و کەسێکی لەگەڵدا نارد. مەئمون پەیامی بۆ یەزیدی نارد. وەرگرتنی ئەم بڕە پارەیە لەهاونشینی ئەو بۆ تۆ بەسوودترە.

عومارە کوڕی عوقەیل دەڵێت: عەبدوالله کوڕی باوکی سەمت پێی وتم: ئایا دەزانی مەئمون شارەزای شێعر نییە. وتم: چ کەسێك لەمەئمون شارەزاترە؟ سوێند بەخوا ئێمە سەرەتای بەیتەکە دەخوێنینەوە و ئەو کۆتاییەکەی دەڵێت. باوکی سەمت وتی: دێڕێکی جوانم بۆ خوێندەوە بەڵام کاریگەری بەروخساریەوە دەرنەکەوت. وتم: کام دێرە. باوکی سەمت وتی:

اضحى امام الهدى المأمون مشتغلا بالدين و الناس بالدنيا مشاغيل

واتاکەی: پێشەوای ڕێنیشاندەر، مەئمون، سەرقاڵی کاروباری دینە و خەڵکان سەرقاڵی کاروباری دنیا.

عومارە وتی: سوێند بەخوا هیچت نەکردووە، چوونکە ئەوت پێش پیرێژنێك نەخست کە لەماڵەکەی خۆی بەتەزبێح تەلیلە دەکات، چوونکە ئەگەر پشت بکاتە کاری دنیا کە بەسەریدا زاڵ بووە، چ کەسێك کاروبارەکان هەڵسورێنێت؟ بۆ ئەو

هۆنراوەت نەوت کەباوەگەوڕێی من، جەریر بۆ وەسفی عەبدولعەزیز کوڕی وەلید وتی:

فلا هو فی الدنیا یضیع نصیبه و لا عرض الدنیا عن الدین شاغله

واتاکەی: نەبەشی خۆی لەدنیا بەفیرۆ دەدات و نە کالاکانی دنیا ئەو لەکاروباری دین دوور دەخاتەوە.

باوکی سەمت وتی: هەنووکە هەستم بەکەم و کوڕی وتەکەی خۆم کرد.

باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمار دەڵێت: مەئمون خوازیاری شوێنکەوتەکانی عەلی بوو، بەردەوام چاکەی لەگەڵ دەکردن. ئەم کارەی نە بۆ خۆنواندن دەکرد نە وەك عادەت.

یەکێك لەپێشهاتەکان ئەوە بوو لەرۆژگاری ئەو حسەین کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەینی عەلەوی کۆچی دوایی کرد. ئەو خۆی لەنوێژی مردوو حازر بوو. خەڵك خەم و پەژارەی قوڵیان لەروخساری ئەودا بینی و سەریانسوڕما. لەدوای ئەو یەکێك لەمناڵەکانی زێنەب کچی سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس کەکچە مامی مەنسور بوو، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. مەئمون کفنی بۆ نارد و ساڵحی برای راسپارد لەسەر جەنازەکەی نوێژ بخوێنێت. ساڵح ڕۆشتە لای دایکی کچە و هاوخەمی خۆی نیشاندا و لەوەی مەئمون نەیتوانیوە بۆ نوێژی مردوو بێت، داوای بەخشینی کرد. بەلام توڕەیی لەروخساری زێنەب دەرکەوت و بەکوڕی کوڕەکەی وت: تۆ خۆت برۆ پێش و بۆ باوکت نوێژ بخوێنە ئەم هۆنراوەی وەك نمونە هێنایەوە:

سبکناه و نحسبه لجینا فابدی الکیر عن خبث الحدید

واتاکەی: ئەوام کردە قاڵب و بەسیم مان لەقەڵەمدا بەلام کوڕی ئاسن تواندنەوە کەئەوی تواندەوە، دەریخست کەئەو ئاسنێکی پەست و کەم بەهایە. بەساڵحی وت: بەمەئمون بڵێ: ئەی کوڕی مەراجل، ئەگەر ئەم مردووە یەحیا کوڕی حسەین کوڕی زەید دەبوو، لەپشت جەنازەکەیەوە رات نەدەکرد.

## خەلافەتی موعتەسەم

ئەو، باوکی ئیسحاق، محەممەد کوڕی هارون ڕەشیدە کەدوای مەرگی مەئمون بەیعەتی خەلافەتی بۆ وەرگیرا. کاتێك دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد، سوپاییەکان قوت بوونەوە و ناوی عەباس کوڕی مەئمونیان هێنایە سەرزمان. موعتەسەم کەسی بەدوای عەباسدا نارد و بەیعەتی لێ وەرگرت. عەباس ڕۆشتە لای سوپاییەکان و پێی وتن: لەم هاوڕێیەتییە بێ بنەمایە خۆی بەدوور دەگرێت و هاوشێوەی خەلیفە بەیعەت لەگەڵ مامی دەکات. هەموان بێدەنگ بوون. موعتەسەم فەرمانیدا تا بەفەرمانی مەئمون ئەوەی لەتوانە بناغەیان بۆ داڕشتبوو، وێران بکەن. کەل و پەلی شەڕ و کەرەستەکانی دیکەی کۆکردەوە و ئەوانەی دیکەی کردە پاروی ئاگر کە (لەبیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك) ئاماژەی پێدەدەین. ئەوخەڵکی شارە جۆراوجۆرەکانی بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕاندەوە و خۆی لەگەڵ عەباس کوڕی مەئمون ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان، گەیشتە ئەو شارە.

## ناسازگاری فەزڵ لەگەڵ زیادە الله

لەم ساڵەدا زیادە الله کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە سوپایەکی بۆ جەنگی فەزڵ کوڕی باوکی عەنبەر لەجەزیرە ڕەوانە کرد. ئەو نەیاری زیادە الله بوو. فەزڵ لەعەبدولسەلام کوڕی مەفرەجی ڕیبعی داوای هاوکاری کرد. ئەویش لەدەورانی ئاژاوەی مەنسور ڕێگەی ناسازگاری زیادەاللەی گرتەبەر. فەزڵ بەرێکەوت و ڕووبەڕووی سوپاکەی زیادەالله بوویەوە. لەنێوان دوو سوپا لەشاری یەهود لەجەزیرە شەڕێکی ماڵوێرانکەر ڕوویدا و عەبدولسەلام کوژرا و سەریان لەجەستە جیاکردەوە و بردیانە لای زیادە الله.

فەزڵ کوڕی باوکی عەنبەر ڕووی کردە تونس و ڕۆشتە ناو شارەکە و لەوێ سەنگەری گرت. زیادەالله سوپایەکی بۆ جەنگ ڕەوانە کرد. گەمارۆیان خستە سەر فەزڵ و بارودۆخیان لێ دژوار کرد و سەرئەنجام دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت. کاتێك سوپا ڕۆشتە ناو شارەکە، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکیان کوشت کەیەکیان

عەباس کوڕی وەلیدی فەقیە بوو. عەباس لەماڵەکەی خۆی مابوویەوە و نەدەجەنگا. چەند سەربازێك ڕۆشتنە بەردەم ماڵەکەی، لەم کاتەدا شمشێری هەڵگرت و هاواری جیهادی بەرز کردەوە. بەمشێوەیە کوژرا. جەنازەکەی بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەوێرانەیەکدا کەوت و لەم ماوەدا هیچ دڕندەیەك لێی نزیك نەکەوتەوە. حەدیسی لەکوڕی عۆیەیینە و کەسانی دیکە گێڕاوەتەوە. پیاوێکی چاکەکار بوو. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی شارەکە هەڵاتن. دواتر زیادەالله ئەمانی بەهەموان بەخشی و خەڵکان بۆ ماڵ و حاڵی خۆیان گەڕانەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەئمون بۆ سەلغوس گەڕایەوە و عەباسی کوڕی بۆ توانە نارد و فەرمانی دروست کردنی پێدا. مەئمون بۆ ئەنجامی ئەم کارە، کرێکارەکانی ڕەوانە کرد. ئەوان سەرەتا شوێنەکەیان ئەندازە گرت و دیوارەکەیان بەئەندازەی سێ فەرسەخ دروست کرد و چوار دەرگایان تێکرد. لای هەر دەرگایەك بورجێکیان دروست کرد. نامەیان بۆ هەموو شارەکان نووسی تا لەهەر شارێك دەستەیەك بۆ هاتن بۆ توانە هەڵبژێرن. کرێی هەر سوارکارێك سەد درهەم و هەر پیادەیەك چل درهەم دیاریکرا.

لەم ساڵەدا بیشر کوڕی غیاسی مورەیسی کەباوەڕی بەئافراندنی قورئان و دیاردەکانی دیکە بوو، مرد.

لەم ساڵەدا ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی کوێستانەکان (زاگرۆس و کرمانشان) و هەمەدان و ماسەبزان و ئیسفەهان و شارەکانی دیکە، باوەڕیان بەئایینی خوڕەمییەکان هێنا و لەدەروی کۆبوونەوە و لەدەوروبەری هەمەدان ئوردوویان لێدا. موعتەسەم سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەب لەناویاندا دەبینرا کە لەمانگی شەوال/ ١٩ ئۆکتۆبەر، فەرمانڕەوایی کوێستانەکانی پێسپارد. ئیسحاق لەشکرکێشی کرد و لەنزیك هەمەدان ڕووبەڕوویان بوویەوە و شەست هەزار کەسی لێ کوشتن و کەسانی دیکە بۆ ڕۆم هەڵاتن.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی عەباس کوڕی محەممەد ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نۆزدەی کۆچی ( ٨٣٤ زایینی )

## ناسازگاری محەممەد کوڕی قاسمی عەلەوی

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی قاسم کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەتاڵەقان ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و پێشنیاری ڕەزامەندی بنەماڵەی محەممەدی دەکرد.

ئەو لەسەرەتادا گۆشەگیری مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) و کەسێکی چاکەکار بوو. یەکێك لەخەڵکانی خوراسان بەناوی باوکی محەممەد کە لەنزیك حەرەم دەمایەوە، کاتێك کردەوەکانی ئەوی بینی، سەری سوڕما و پێی وت: تۆ لەهەر کەسێکی دیکە زیاتر شیاوی خەلافەتیت، ئەم وتەی ڕازاندەوە و دەستی بەیعەتی بۆ درێژ کرد. ئەم پیاوە خوراسانییە، بەردەوام حاجییەکانی خوراسانی لەدەوری ئەو کۆدەکردەوە و ئەوان بەیعەتیان لەگەڵ دەبەست. ئەم کارە بۆ ماوەیەك بەردەوام بوو.

کاتێك محەممەد فراوانی شوێنکەوتەکانی بینی، لەخوراسانەوە ڕێگەی جوزجانیان گرتەبەر. لەوێ خۆی شاردەوە و باوکی محەممەد پێشنیاری بەستنی بەیعەتی ئەوی بەخەڵکان دەکرد. هاوەڵانی محەممەد کوڕی قاسم زیادیان کرد و ئەو باوکی محەممەدی ناچار کرد بزوتنەوەکەی خۆی دەست پێبکات. محەممەد کوڕی قاسم کارەکەی بزوتنەوەکەی لەتاڵەقان دەستپێکرد و خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. لەنێوان ئەو و سەرکردەکانی عەبدوالله کوڕی تاهیر لەتاڵەقان و کوێستانەکان چەندین جەنگ ڕوویدا. محەممەد کوڕی قاسم و سوپاکەی شکستیان خوارد و ئەو ڕووی کردە گوندەکانی خوراسان چوونکە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە نامەیان بۆ نوسیبوو.

کاتێك محەممەد کوڕی قاسم گەیشتە نەسا، باوکی یەکێك لەهاوڕێکانی کە لەو ناوچە دەژیا، سەبارەت بەو پرسیاری لەمناڵەکەی کرد. مناڵ لەچۆنیەتی و چەندایەتی ئاگاداری کردەوە و باوك ڕۆشتە لای کارگوزاری نەسا و لەبوونی محەممەد کوڕی قاسم لەو شارە ئاگاداری کردەوە. کارگوزار بۆ ئەم هەواڵە دەهەزار درهەمی پێ بەخشی. کارگوزار هاتە لای محەممەد، ئەوی گرت و قۆڵبەست کراو

ڕەوانەی بارەگای عەبدوالله کوڕی تاهیری کرد. عەبدوالله تاهیری ڕەوانەی بارەگای موعتەسەم کرد. محەممەد لەنیوەی رەبیع الاوەل/ ٢٩ مارس گەیشتە بارەگای موعتەسەم و لای مەسرور، گەورەی نۆکەرەکانی موعتەسەم، زیندانی کرا. ئەو بڕی خۆراکی محەممەدی دیاریکرد و دەستەیەکی بۆ چاودێری کردنی ئەو ڕاسپارد. لەشەوی جەژنی قوربان کاتێك خەڵکان سەرقاڵی ئامادەکارییەکانی جەژن بوون، محەممەد لەزیندان هەڵات. تەنافێکیان لەکونی سەقفی زیندانەکەوە بۆ خستەخوار و لەوێ هێنایانەدەر. بەیانی کاتێك ناشتاییان بۆ برد، محەممەدیان نەبینی. سەد هەزار درهەمیان وەك پاداشت بۆ کەسێك دیاریکرد تا هەواڵێك لەو بەدەست بێنێت بەڵام کەس نەیزانی چی بەسەرهات.

جەنگ لەگەڵ خەڵکانی زەت

لەجومادی الاخر/ ١٢ ژوئەنی ئەم ساڵە، موعتەسەم، عوجەیف کوڕی عەنبەی بۆ جەنگ لەگەڵ خەڵکانی زەت ڕەوانە کرد کەدەستیان بەسەر بەسرەدا گرتبوو و خراپەکارییان کردبووە پیشە و لەخەرمانەکانی کەسکەر و دەوروبەری بەسرە، دانەوێڵەیان تاڵان دەکرد و ئاسایشی ڕێگەکانیان شێواندبوو. لەبنەکانی بەرید (پۆستە) ئەسپەکان دانران تا هەواڵەکان بەخێرایی بگوازنەوە بەشێوەیەك کاتێك هەواڵ لەلایەن عوجەیفەوە دەنێردرا، هەمان ڕۆژ بەدەستی موعتەسەم دەگەیشت. عوجەیف پێشڕەوی کرد و لەواست نزیك کەوتەوە و لەکەنار ڕووباری بردوا ئوردووی لێدا. عوجەیف ڕێگەکانی لەسەر خەڵکانی زەت بەست و جەنگی دەستپێکرد. تەنیا لەجەنگێکدا پێنسەد کەس لەجەنگاوەرانی ئەوانی ئەسیر کرد و لەجەنگێکی دیکە، سێسەد کەسیان لێ کوژرا. عوجەیف ئەسیرەکانی کوشت و سەرە بڕاوەکانی بۆ بارەگای مۆعتەسەم نارد.

عوجەیف بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەبەرابەر خەڵکانی زەت مایەوە و ژمارەیەکی زۆری ئەوانی ملکەچ کرد. پێشەوای خەڵکانی زەت پیاوێك بەناوی محەممەد کوڕی عوسمان و بەڕێوبەری کارەکانی بەسوماق ناودەبرا. عوجەیف لەهەمان شوێند ئوردووی لێدا و بۆ ماوەی حەوت مانگ لەوێ مایەوە.

## گەمارۆی تۆلدۆ

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی حەکەمی ئومەوی، پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بەفەرماندەیی ئومەییە کوڕی حەکەم بەرەو تۆڵدۆ ڕەوانە کرد و ئەو، گەمارۆی خستە سەر شارەکە.

دانیشتوانی ئەم شارە ڕێگەی ناسازگاری حەکەمیان گرتەبەر و گوێڕاڵەی فەرمانەکانی نەدەبوون. حەکەم بۆ لەناو بردنی خەڵکانی تۆڵدۆ پێداگری کرد، دارەکانی بڕییەوە و کێڵگەکانی لەناو برد بەڵام ملکەچ نەبوون. بەناچاری ئەوانی پشتگوێ خست و ڕووی کردە قەڵای ڕەباح و سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی مەیسەرە لەوێ دانا. مەیسەرە بەفەتی باوکی ئەیووب بەناوبانگ بوو. کاتێك سوپاکەی ئومەییە دوور کەوتەوە، خەڵکانی تۆڵدۆ شۆڕشیان کرد بۆ ئەوەی مەیسەرە و سوپاکەی بەشێوەیەکی لەناکاو لەناو ببەن بەڵام مەیسەرە ئاگادار بوویەوە و لەهەموو شوێنەکانی تۆڵدۆ بۆسەی نایەوە. کاتێك خەڵکانی تۆڵدۆ بۆ هێرشی لەناکاو گەیشتنە قەڵای ڕەباح، سوپاییەکان لەهەر سوچ و قوژبنێکەوە هێرشیان کردنەسەر و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. ئەوانەی ڕزگاریان بوو، بۆ ناو شارەکە هەڵاتن. سەری کوژراوەکانیان لەبەردەم بارەگای مەیسەرە کۆکردەوە. کاتێك مەیسەرە زۆری ژمارەی کوژراوەکانی بینی، ترس و خەمێکی قووڵ دایگرت و تەنیا چەند ڕۆژ دوای ئەم ڕوداوە، مرد.

لەم ساڵەدا شۆڕشێکی گەورە لەتۆڵدۆ سەری هەڵدا کە بەمەلحەمە ئەلعەراس بەناوبانگە. لەدەرئەنجامی ئەم شۆڕشە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی شارەکە کوژران.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موعتەسەم، ئەحمەد کوڕی حەنبلی (پێشەوای مەزهەبی حەنبەلی کەچوارەمین مەزهەبی سونییەکانە)، بۆ بارەگاکەی بانگ کرد و بەقورئان ئەزمونی کرد (ئایا قورئان ئافرێنراوە یا نە) بەڵام ئەو ئافراندنی قورئانی پشتراست نەکردەوە. موعتەسەم فەرمانیدا و بەرادەیەك ئەشکەنجەیان کرد کەئاوزی لەدەستدا و پێستی جەستەی لەت بەت بوو. دواتر زیندانییان کرد.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لەمانگی جومادی الاوەل/ ١٣ مەی هاتە بەغداد و لەگەڵ خۆی ژمارەیەکی زۆر لەئەسیرە خوڕەمدینەکانی هێنا. دەڵێن: ژمارەی ئەم ئەسیرانە جگە لەژن و منداڵەکان، سەد هەزار کەس بووە.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی نوعەیم فەزڵ کوڕی دوکەینی مەلائی موالی تەڵحە کوڕی عەبدوللە تیمی لەمانگی شەعبان مرد. ئەو لەماموٚستاکانی بوخاری و موسلیم بوو. لەساڵی ٧٤٧/١٣٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. بەشیعە لەقەڵەم دەدرا و شوێنکەوتەکانی ئەو بەدۆکەینییە ناو دەبەن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیستی کۆچی ( ٨٣٥ زایینی )

## سەرکەوتنی عوجەیف بەسەر خەڵکانی زەت

لەم ساڵەدا عوجەیف دوای ئەوەی باروودۆخی لەخەڵکانی زەت دژوار کرد، جەنگی هەڵگیرساند وئەوانی هێنایە بەغداد. خەڵکانی زەت داوای ئەمانیان کرد و رازی بوو. ئەوان لەزیحەججەی ساڵی ٢١٩/ ٢٨ ئوتی ٨٣٤ زایینی ملکەچی خۆیان نیشاندا. ژمارەی ئەوان بەژن و منداڵەوە دەگەیشتە بیست و حەوت هەزار کەس کەدوانزە هەزار کەسیان جەنگاوەر بوون. کاتێك خۆیاندا بەدەستەوە، عوجەیف بەهەمان شێوە کەبەشداری جەنگیان دەکرد، ئەوانی سوار کەشتی کرد. هاوشێوەی جەنگ فوویان دەکرد بەشەیپورەکاندا و لەعاشورای ئەم ساڵە ئەوانی بردە ناو شاری بەغداد.

موعتەسەم سوار لەسەر کەشتییەك بەناوی زوو هاتە شەماسییە تا بەهەمان شێوە سەیری خەڵکانی زەت بکات. عوجەیف بەهەرکام لەجەنگاوەرانی خۆی دوو دیناری بەخشی. خەڵکانی زەت بۆ ماوەی سێ رۆژ لەناو کەشتییەکاندا مانەوە و دواتر بۆ بەشی رۆژهەڵات گوێزرانەوە و بەبیشر کوڕی سەمیدوع سپێردران. بیشر ئەوانی بۆ خانەقین و سەرزەمینە سنووریەکان و دواتر عەین زەربە برد. لەوێ رۆمییەکان هێرشیان کردنەسەر و بەشێوەیەك لەناویان بردن کەتەنانەت یەك کەسیان گیانی دەرنەبرد.

## لەشکرکێشی ئەفشین بۆ جەنگ لەگەڵ بابەکی خورەم دین

لەم ساڵەدا موعتەسەم فەرمانڕەوایەتی کوێستانەکانی[١٤] بەئەفشین کوڕی حەیدەر کوڕی کاوس سپارد و ئەوی بۆ جەنگی بابەك ڕەوانە کرد.

سەرەتای دەرکەوتنی بابەك ساڵی ٢٠١/ ٨١٦ زایینیە. پایتەختی ئەو شاری بەز بووە. ژمارەیەکی زۆر لەسوپای خەلیفەی کوشت و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی لەخاك و خوێندا گەوزاند. کاتێك موعتەسەم خەلافەتی گرتەدەست، باوکی سەعید محەممەد کوڕی یوسفی بۆ ئەردەبیل نارد وفەرمانی پێدا قەڵاکانی نێوان زەنجان و ئەردەبیل سەرلەنوێ ئاوەدان بکاتەوە کەبابەك وێرانی کردبوو. هەروەها پاسەوانەکان راسپێرێت تا پارێزگاری لەخواردەمەنییە ڕەوانە کراوەکان بۆ ئەردەبیل بکەن. باوکی سەعید بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە بەرێکەوت و قەڵاکانی دروست کرد.

بابەك لەیەکێك لەجەنگەکان دەستەیەکی بۆ هێرشی لەناکاو بۆ چەند ناوچەیەك لەکەنارەکان ڕەوانە کرد. ئەم دەستەیە دوای تاڵانی گەڕانەوە. باوکی سەعید ئاگادار بوویەوە. هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و شوێنپێی ئەم دەستەی هەڵگرت و دوای بڕینی بەشێك ڕێگە، پێیان گەیشتەوە و شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا هەڵگیرسا. باوکی سەعید دەستەیەك لەسەربازەکانی بابەکی کوشت و دەستەیەکی ئەسیر کرد و ئەوەی سەربازەکانی بابەك تاڵانیان کردبوو، وەریگرتەوە. سەعید سەرە بڕاوەکان وئەسیرەکانی بۆ بارەگای موعتەسەم ڕەوانە کرد. ئەمە یەکەم شکستی بابەك و سوپاکەی بوو.

پێشهاتێکی دیکە، ئاژاوەی محەممەد کوڕی بوعەیس بوو. چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو محەممەد پاسەوانی قەڵایەك بوو بەناوی شاهی. ئەم قەڵایە کوڕی بوعەیس لەکوڕی ڕەوادی سەندبوو. ئەم قەڵایە یەکێك لەئاوەدانییەکانی ئازەربایەجان بوو. ئەو، قەڵایەکی دیکەی لەئازەربایەجان بوو بەناوی تێبریز.

---

[١٤] لەرۆژگاری کۆندا ناوی ناوچەیەکی بەرفراوان لەناوەند و رۆژئاوای ئێران بووە کە لەرۆژهەڵاتەوە بەخوراسان و لەرۆژئاواوە بەئازەربایەجان کۆتایی دەهات کەبریتی بوو لەم ناوچانە: ئیسفەهان، کاشان، ساوە، لورستان، هەمەدان، قەزوێن، زەنجان و کرمانشان. (وەرگێڕ)

پەیوەندی هاورێیەتی لەنێوان ئەو و بابەك دەبینرا و دەستە شەڕکەرەکانی بابەك لای کوڕی بوعەیس دادەبەزین و ئەو ڕێزی دەگرتن بەشێوەیەك سەربازەکانی بابەك ببوونە هاودەمی. بابەك یەکێك لەسوپاسالارەکانی خۆی بەناوی عیسمەت لەگەڵ دەستەیەك بۆ قەڵاکەی کوڕی بوعەیس نارد و ئەو بەهەمان شێوەی جاران میوانداری کردن. کوڕی بوعەیس بەبۆنەی هاتنی عیسمەت، کەسە نزیك و تایبەتییەکانی خۆی کۆکردەوە. کوڕی بوعەیس سفرەیەکی ڕازاندەوە و بەرادەیەك شەرابی دەرخوارددان کەهەمووان مەست و سەرخۆش بوون. دواتر هێرشی کردە سەر عیسمەت و ئەسیری کرد و هاوەڵانی کوشت. فەرمانیدا سەربازەکانی بابەك یەك یەك بانگ بکەن. هەرکات کەسێکیان بانگ دەکرد، ئەو دەڕۆشتەسەر و دەیانکوشت تا ئەوەی کەسانی دیکە ئاگادار بوونەوە و هەڵاتن. ئەو عیسمەتی بەموعتەسەم سپارد. موعتەسەم پرسیاری شوێنی بابەکی لێکرد و ئەو شوێنی بابەك و چۆنیەتی زاڵ بوون بەسەر بابەکی پێ وتن. موعتەسەم، عیسمەتی زیندانی کرد و تا ڕۆژگاری واسق لەزیندان مایەوە.

ئەفشین ڕێگەی سەرزەمینی بابەکی گرتەبەر و لەبەرزەند ئوردووی لێدا. ڕێگەکان و قەڵاکانی نێوان بەرزەند و ئەردەبیلی خستە ژێر چاودێرییەوە و محەممەد کوڕی یوسفی ڕەوانەی شوێنێك بەناوی خەش کرد. محەممەد بەدەوری سوپاکەی خەندەکی هەڵکەند. دواتر هەیسەمی غەنەوی بۆ گوندی ئەرشەق ڕەوانە کرد. هەیسەم قەڵاکەی ئەرشەقی سەر لەنوێ نۆژەن کردەوە و خەندەکی هەڵکەند. ئەفشین، عەلەوییەی یەکچاوی بۆ قەڵای نەهر لەنزیك ئەردەبیل ڕەوانە کرد. ئەو، لەسەرکردەی ئەبنا[15] (کوڕەکان) بوو. پیادەکان و کاروانییەکان لەئەردەبیلەوە دەهاتن. ئەوان پاسەوانیان لەگەڵدا بوو کەتا گەیشتن بەقەڵای نەهر پارێزگارییان لێدەکردن و هەیسەمی غەنەوی کاروانی تا گەیشتن بەشوێنی مەبەست دەپاراست. هەیسەم سوپاکەی خۆی بۆ لای هاوەڵانی باوکی سەعید ڕەوانە کرد( ئەوانەی هاتبوونەدەر و لەنیوەی ڕێگە مابوونەوە). باوکی سەعید و هاوەڵانی، هاورێکانی

---

[15] ئەبنا، مەبەست لێیان منداڵە وەفادارە ئێرانییەکانە کەخەلافەتی منداڵەکانی عەباسیان هێنایە ئاراوە و پشت لەدوای پشت درێژەیان بەخزمەتی نیزامیدا و لای عەباسییەکان پێگەیەکی بەرزیان پێبڕابوو.

خۆیان تەسلیم بەهەیسەم دەکرد. هەیسەمیش هاوەڵانی خۆی بەباوکی سەعید دەدا و باوکی سەعید و هاوەڵانی لەگەڵ کاروانییەکان روویان دەکردە خەش و هەیسەم و هاوەڵانی لەگەڵ کەسانی ژێر فەرمانیان روویان دەکردە ئەرشەق تا لەدوایین رۆژ لەوێ بن و ئەوان بەعەلەوییەی یەك چاو و هاوەڵانی بسپێرن. باوکی سەعید و هاوەڵانی روویان دەکرد خەش و دواتر رێگەی ئوردووگای ئەفشینیان دەگرتەبەر. سالاری کاروانی ئەفشین دەهاتە لای و خەڵکی کاروانی لێ وەردەگرت وئەوانی دەگەیاندە ئوردووگای ئەفشین. کاروبار بەمشێوە بوو. هەرکات سیخورێکیان دەگرت، دەیانبردە لای ئەفشین. ئەفشین چاکەی لەگەڵ دەکرد و دیاری پێ دەبەخشی و پرسیاری ئەو شتانەی دەکرد کەبابەك پێی دەدان. ئەو دوو بەرابەری بابەك پارەی بەسیخوڕەکە دەدا و پێی دەوتن: سیخوڕی ئێمە بن و لەپاداشتەکانی ئێمە کەڵك وەربگرن.

## جەنگی ئەفشین لەگەڵ بابەك

لەم ساڵەدا جەنگی نێوان ئەفشین و بابەك دەستی پێکرد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی بابەك کوژران.

هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو موعتەسەم، بوغای گەورەی لەگەڵ سامان و دارایی فراوان بۆ سوپاییەکان ڕەوانە کرد. ئەو گەیشتە ئەردەبیل و بابەك ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان ئامادە کرد تا پێش گەیشتنی ئەو بۆ ئوردووگای ئەفشین، هێرشی بکەنەسەر. سیخوڕەکان ئەفشینیان لەم مەبەستە ئاگادار کردەوە. کاتێك ئەفشین راستی هەواڵەکانی بۆ دەرکەوت، نامەیەکی بۆ بوغا نووسی و فەرمانی پێدا وا نیشان بدات مەبەستی ڕۆشتنی لەسەردایە و درێژە بەرێگە دەدات. فەرمانی پێدا سامانەکان بخاتە سەر پشتی وشترەکان و ملی رێگە بگرێتەبەر تا دەکات قەلای نەهر. دواتر پاسەوانەکان لەوێ بەجێبێڵێت و کاروانییەکان درێژە بەرێگەی خۆیان بدەن و دوای ڕۆشتنی کاروانییەکان سامانەکان بۆ ئەردەبیل بگەڕێنێتەوە.

بوغا ئەو کارەی کرد و کاروان ڕۆشت. سیخوڕەکان هاتنە لای بابەك و

ئاگاداریان کردەوە کەسامانەکان گەیشتە نەهر. ئەفشین لەهەمان ڕۆژ کە لەگەڵ بوغا دیاریکردبوو، دەمەو ئێواریێ لەبەرزەند سوار ئەسپەکەی بوو و لەکاتی ئاوابوونی هەتاو خۆی گەیاندە خەش، لەدەرەوەی خەندەکی باوکی سەعید هاتەدەر و لەکاتی شەو، بەشێوەیەکی نهێنی و بێ ئەوەی تەپڵەکان لێ بدرێن و ئالایەك هەڵبکرێت، سوار ئەسپەکەی خۆی بوو. فەرمانیدا سوپاییەکان لەرێگەدا بێدەنگ بن و بەخێرایی رێگە ببڕن.

کاروان لەهەمان ڕۆژ لەنەهر بەرەو کەنارەکانی هەیسەم بەرێکەوت. بابەك سوپاکەی خۆی ئامادە و رێگەی نەهری گرتبووە بەر. بابەك گومانی دەکرد دەتوانێت دەست بەسەر سامانەکاندا بگرێت. سوارەکانی بابەك هێرشیان کردە سەر کاروانەکە. فەرماندەی پادگانی نەهر بەرگری کرد بەڵام کوژرا و سەربازەکانی هاورێی، شەرابی مەرگیان نۆش کرد و هەموو سامانەکەیان تالآن کرا. سوپاکەی بابەك دڵنیا بوونەوە لەوەی هیچ سامانێك لەئارادا نییە. سەربازەکانی بابەك ئالای قەڵادارى نەهریان ڕفاند و جل و بەرگی سەربازە کوژراوەکانیان لەبەر کرد تا خۆیان هاوشێوەی پاسەوانانی نەهر نیشان بدەن بۆ ئەوەی بتوانن بەم شێوەیە بەسەر هەیسەمی غەنەوی و سوپاکەی سەرکەوتن بەدەست بێنن بەڵام نەیاندەزانی ئەفشین خۆی بۆ جەنگ ئامادە کردووە. سەربازەکانی بابەك پێشڕەوییان کرد هاوشێوەی پاسەوانەکانی نەهر بەڵام نەیاندەزانی شوێنی وەستانی ئالادارەکە کوێیە و بەناچاری لەشوێنێك ریزیان بەست کەنەدەبوا ریز ببەستن.

هەیسەم هات و لەشوێنی پێویست وەستا و لەکارەکەی ئەوان سەری سوڕما. کوڕە مامەکەی بۆ لای ئالادارەکە نارد و داوای لێکرد بزانێت بۆ بەمشێوەیە ریزیان بەستووە. کوڕە مامی هەیسەم ڕۆشت و ئەوانی بینی. زانی هێزی دوژمنن و گەڕایەوە و هەیسەمی ئاگادار کردەوە. هەیسەم بۆ دڵنیابوون دەستەیەکی دیکەی ڕەوانە کرد. ئەوان ڕۆشتن و ئەو دەستەیان نەناسییەوە و دڵنیا بوون لەدوژمنەکانن. بۆیان ئاشکرا بوو ئەوان عەلەوییە فەرماندەی نەهریان کوشتووە و سەربازەکان، جل و بەرگی کوژراوەکانیان لەبەر کردووە و ئالاکەیان هەڵکردووە و خۆیان بەپاسەوانەکانی نەهر لەقەڵەم دەدەن. هەیسەم بەخێرایی گەڕایەوە و کاروانەکەی

هاورێی ڕزگار کرد. خۆی و پاسەوانەکانی لەپشتەوە پارێزگارییان لەکاروانەکە دەکرد تا گەیشتنە قەڵای ئەرشەق. دوان لەهاوەڵانی خۆی بۆ لای باوکی سەعید و ئەفشین ڕەوانە کرد و ئاگاداری کردنەوە. ئەوان بەخێرایی بەڕێکەوتن. هەیسەم پەنای بۆ قەڵاکە برد و بابەك گەیشت و گەمارۆی خستەسەر. لەبەردەم قەڵاکە کورسییان بۆ بابەك دانا و لەسەری دانیشت. پەیکی بۆ لای هەیسەم نارد: لەقەڵاکە وەرە دەر و بگەڕێرەوە. هەیسەم بەم کارە ڕازی نەبوو. بابەك وەك عادەتی هەمیشەیی لەکاتی جەنگ، دەستی بەخواردنەوە کرد.

دوو نێردراوەکەی هەیسەم دوای بڕینی کەمتر لەیەك فەرسەنگ بەئەفشین گەیشتن. ئەفشین بەفەرماندەی پێشەنگەکانی خۆی وت: دوو پەیك دەبینم بەخێرایی بەرەو ئێرە دێن، وتی: کوس لێدەن و ئاڵاکان هەڵکەن و بەدەم وتنەوەی (لبیك) بۆ لایان بڕۆن. ئەو کارەیان کرد و جڵەوی ئەسپەکانیان شل کرد و خۆیان لەبابەك نزیك کردەوە. بابەك هێشتا لەسەر کورسی سەرقاڵی خواردنەوە بوو. هێشتا سوار ئەسپەکەی نەبوو کەرووبەرووی سوپاکەی ئەفشین بوویەوە و شەڕ دەستی پێکرد. تەنیا بابەك و چەند کەس لەسوپاکەی ڕزگاریان بوو. بابەك توانی خۆی بگەیێنێتە موقان (چوونکە پەیوەندی ئەو لەگەڵ هاوەڵانی پچڕابوو). ئەفشین بۆ بەرزەند گەڕایەوە.

بابەك لەموقان مایەوە و پەیکی بۆ بەز نارد و ژمارەیەکی زۆری سوپاییەکان پەیوەستی بوون. بابەك ئەوانی لەموقانەوە بۆ بەز برد. ئەفشین لەبەرزەند مایەوە. لەیەکێك لەڕۆژەکان کەکاروانێك تێدەپەڕی، یەکێك لەسوپاسالارەکانی بابەك هێرشی کردەسەر و سامانەکەی تالان کرد و بەمشێوەیە سوپاکەی ئەفشین گرفتاری قاتوقڕی بوون. ئەفشین نامەیەکی بۆ فەرمانڕەوای مەراغە نووسی تا بەخێرایی خواردنیان بۆ ڕەوانە بکات. فەرمانڕەوای مەراغە کاروانێکی گەورەی ڕەوانە کرد. لەم کاروانەدا جگە لەچوارپێکانی دیکە، نزیکەی هەزار مانگا، خواردنیان لێ بار کرا بوو و سوپایەك پارێزگاری دەکرد. لەم کاتەدا سوپای بابەك هێرشیان کردە سەر کاروانەکە و دەستیان بەسەر هەموو شتەکاندا گرت و سوپاکە ڕووبەڕووی کەمی خواردەمەنی بوویەوە. ئەفشین نامەیەکی بۆ کارگوزاری شیروانە نووسی و فەرمانی پێدا خواردەمەنی ڕەوانە بکات. ئەویش کاروانێکی ڕەوانە کرد و خەڵکی لەبەلای لەناوچوون ڕزگار کرد. بوغایش بەسامانێکی زۆرەوە پەیوەستی ئەفشین بوو.

## دروست کردنی شاری سامەرا

لەم ساڵەدا موعتەسەم مەبەستی سامەرای کرد تا بناغەی شارێك لەو ناوچەیە داڕێژێت. هۆکارەکەی ئەوە بوو دەیوت دەترسم ڕۆژێك شەڕئەنگێزەکان دژی کۆیلەکانی من ڕاپەڕن و دەمەوێت ئەگەر ڕۆژێك لەدەریا یا لەڕێگەی وشکانیەوە مەبەستی ئەوانیان کرد، بەهێزتر لەوان بم. موعتەسەم سەردانی شوێنەکەی کرد و بەسەرزەمینێکی شیاوی بینی.

هەروەها دەڵێن: هۆکاری موعتەسەم لەدروست کردنی شارەکە ئەمە بووە: ئەو هەزاران کۆیلەی تورکی بوو، هەرچەند ساتێك یەکێك لەوانی بەکوژراو دەبینی. هۆکارەکەی ئەوە بوو دەستەی کۆیلەکانی موعتەسەم دڵڕەق بوون. ئەوان دەپەڕینە سەر ئەسپەکان و بەناو کۆڵان و گەڕەکەکاندا دەسوڕانەوە و زیانیان لەژن و پیاو و منداڵ دەدا. ئەبنا ئەوانیان لەئەسپ دەهێنایە خوار و بەرادەیەك لێیان دەدان کەیەکیان لێ دەکوژرا. بەکورتی ئەوەی خەڵك لەکرداری کۆیلەکان بێزار ببون.

موعتەسەم لەڕۆژێکی جەژندا سوار ئەسپەکەی بوو. پیرەپیاوێك لەبەردەمی وەستا و وتی: ئەی باوکی ئیسحاق، سەربازێك ویستی ئەو لەسەر ڕێگەکە دوور بخاتەوە، بەڵام موعتەسەم ڕێگەی لەسەربازەکە گرت و وتی: ئەی پیرەپیاو، چیت دەوێت؟ پیرەپیاو وتی: هیوادارم خواوەند بۆ ڕێزگرتن لەماف دراوسێ، پاداشتت نەدات. تۆ لەگەڵ ئێمە ژیایت و ئەم کۆیلە تورکە دڵڕەقانەت لەبەرابەر ئێمەدا نیشتەجێ کرد و لەنێوان ئێمەدا جێگەت بۆ کردنەوە. منداڵەکانی ئێمەت هەتیو کرد و ژنانی ئێمە بێوەژنن و پیاوەکانی ئێمەت کوشت. موعتەسەم گوێی لەوتەکانی گرت و دواتر ڕۆشتە ناو ماڵەکەی خۆی و چیتر لەو ڕۆژەوە بەسواری نەبینرا. لەکۆشك هاتەدەر و پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد و چیتر نەڕۆشتە ناو بەغداد و لەکەنارەکانی قاتول نیشتەجێ بوو.

مەسروری کەبیر دەڵێت: موعتەسەم لەمنی پرسی: هەرکات ڕەشید لەبەغداد دڵتەنگ دەبوو، دەڕۆشتە کام سەیرانگا؟ وتم: قاتول. ئەو لەوێ شارێکی دروست کردبوو کەهێشتا دیوار و بورجەکانی ماوەتەوە. ئەویش هاوشێوەی موعتەسەم

لەشۆڕشی سوپاییەکان دەترسا.

کاتێك خەڵکانی شام لەشام، شۆڕشیان کرد، ڕەشید ڕۆشتە ڕەققە و لەوێ مایەوە و شاری قاتولی نیوە ناتەواو بەجێهێشت.

کاتێك موعتەسەم ڕووی کردە قاتول، کوڕەکەی واسقی لەجێگەی خۆی دانا. موعتەسەم دەستەیەك لەحوفیەکانی میسری بەکار گرتبوو کەپێیان دەوتن موغاریبە. بەهەمان شێوە دەستەیەکی لەسەمەرقەند و ئەشروسەنە و فەرغانە بەکار گرتبوو و بەفەراغەنە ناویان دەبردن. ئەوان لەهاوەلاٚنی بوون و دوای ئەویش بەهەمان شێوە مانەوە. سەرەتای ئاوەدان کردنەوەی سامەرا ساڵی ٢٢١/ ٨٣٥ زایینی بوو.

## گرتنی فەزڵ کوڕی مەروان

فەزڵ کوڕی مەروان لەبەرەدان بوو. بەشێوەیەکی زۆر جوان دەینوسی (خەتی خۆش بوو). پێش خەلافەتی موعتەسەم لەگەڵ یەحیا جەرمەقانی (دەبیری موعتەسەم) بنەمای پەیوەندی داڕشت و لەپاڵ جەرمەقانی نامەی دەنووسی. کاتێك جەرمەقانی مرد، جێگەی ئەوی گرتەوە و لەگەڵ موعتەسەم ڕۆشتە شام و میسر و سامانێکی زۆری پێکەوەنا و کاتێك موعتەسەم خەلافەتی گرتەدەست، فەزڵ کوڕی مەروان جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست و دەستی بەسەر هەموو دیواندا گرت و سامانێکی زۆری کەڵەکە کرد.

موعتەسەم فەرمانی پێدەدا بەمەیگێڕ و گۆانیبێژەکان پاداشت بدات بەلاٚم فەزڵ ئەو کارەی نەدەکرد. موعتەسەم ئەم کارەی بەلاوە ناخۆش بوو. موعتەسەم قەشمەرێکی بوو بەناوی ئیبراهیم بەلاٚم بەحەفتی ناویان دەبرد. موعتەسەم فەرمانیدا پارەی پێبدەن. ئەم فەرمانەی بەفەزڵدا بەلاٚم فەزڵ هیچی پێنەدا. ڕۆژێك حەفتی لەگەڵ موعتەسەم لەباغەکەی پیاسەی دەکرد. حەفتی پێش خەلافەتیش هاونشینی موعتەسەم بوو و بەگاڵتەوە بەموعتەسەمی دەوت هیچ کات ڕزگارت نابێت (هیچ کات نابیتە خەلیفە). حەفتی پیاوێکی چوارشانە و ئێسقان پان و موعتەسەم لەڕ و لاواز بوو. بەردەوام پێش حەفتی هەنگاوی هەڵدەگرت، ڕووی دەکردە حەفتی و دەیوت: بۆ بەخێرایی ناڕۆییت؟ کاتێك چەند جارێك ئەم وتەی

دووباره کردەوە، حەفتی بەگاڵتەوە وەڵامی دایەوە: گومانم دەکرد لەگەڵ خەلیفەدا ڕێگە دەبڕم نەك لەگەڵ پەیکێکی تیژپێ، سوێند بەخوا هیچ کات ڕزگار نابێت. موعتەسەم بەپێکەنینەوە وتی: ئایا دوای خەلافەت، ڕزگاری ماوە، بەدەستی نەهێنم؟ حەفتی وتی: ئایا گومان دەکەیت، ڕزگار بوویت، نا، سوێند بەخوا تەنیا ناوەکەی تایبەتە بەتۆ و فەرمانی تۆ تا ئەو لای گوێچکەت ڕەوایە و خەلیفەی ڕاستەقینە فەزڵە. موعتەسەم وتی: کام فەرمانەی من جێبەجێ نەکراوە؟ حەفتی وتی: دوو مانگە فەرمانت داوە پارە بەمن بدەن بەڵام هێشتا یەك دینارم بەدەست نەگەیشتووە. لێرەوە موعتەسەم کینەی فەزڵی لەدڵ گرت.

هەروەها دەڵێن: یەکەم کێشە لەکارەکانی فەزڵ ئەوە بوو موعتەسەم بۆ خەرجی خۆی و هەموو کردەوە ئابورییەکانی فەزڵ کەسێکی ڕاسپارد و لەمانگی سەفەر خۆی و بنەماڵەکەی بەدبەخت کرد چوونکە فەرمانیدا بنەماڵەکەی خۆی، پێرستی خەرجییەکانیان بدەن. موعتەسەم، محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زیاتی لەجێگەی فەزڵ دانا و فەزڵی بۆ گوندێك لەسەر ڕێگەی موسڵ دوور خستەوە. ناوی گوندەکە سن بوو. محەممەد، دوای ئەو هەم وەزیر بوو، هەم دەبیر.

فەزڵ، پیاوێکی توڕە، دەست وشك، پەست و خۆپەرەست بوو. کاتێك بەدبەختی یەخەی گرت، خەڵکان سەرکۆنەیان کرد تا ئەو جێگەی کەسێك وتی:

| | |
|---|---|
| لیبك علی الفضل بن مروان نفسه | فلیس له باك من الناس یعرف |
| لقد صحب الدنیا منوعا لخیرها | وفارقها و هو الظلوم المعنف |
| الی النار فلیذهب و من کان مثله | علی ای شئ فاتنا منه ناسف؟ |

واتاکەی: دەبێت فەزڵ بۆ خۆی بگریت چوونکە کەس ناناسین بۆ ئەو بگریت. ئەو لەدنیا بەشێوەیەك ژیا کەرێگەی لەچاکییەکانی دەگرت و هاوشێوەی ستەمکارێك لەم دنیا ڕۆشت کەشیاوی سەرکۆنە کردن بوو. ئەو هەر کەسێك هاوشێوەی ئەوە، بڕواتە ناو ئاگر، ئێمە دەبێت بۆ چ شتێکی ئەو پرسە بگێڕین؟

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ تۆلدۆ ڕەوانە کرد بەلاّم دوای جەنگ، نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت.

لەم ساڵەدا سالح کوڕی عەباس کوڕی محەممەد ڕێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی داود کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کوڕی عەباس کوڕی ئەیووبی هاشمی و عەفان کوڕی موسلیم باوکی عوسمانی سەفاری بەسری، گۆڕیان وەك جیهانی خۆیان هەڵبژارد. عەفان لەتەمەنی هەشتا و پێنج ساڵی لەبەغداد مرد. ئەو لەمامۆستاکانی بوخاری بوو.

فەتحی موسڵی خواپەرەست کە لەئەولیا و کەسە بەخشندەکان بوو، مرد. محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب(ئیمامی نۆیەمی شیعەکان) لەبەغداد مرد. ئەو لەگەڵ هاوسەرەکەی دایکی فەزڵ کچی مەئمون هاتە بەغداد و لەوێ لای باوەگەورێی خۆی موسا کوڕی جەعفەر، بەخاك سپێردرا. واسق نوێژی لەسەر خوێند. ساڵەکانی ژیانی لەبیست و پێنج بەهار کۆتایی پێهات و لەزیحەجەی ئەم ساڵە مرد. سەبارەت بەچۆنیەتی مردنی ئەو بۆچوونەکان جیاوازن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و یەکی کۆچی ( ٨٣٦ زایینی )

## جەنگەکانی بابەك لەم ساڵەدا

لەم ساڵەدا بابەك لەگەڵ بوغای گەورە جەنگی و شکستیدا و دوای ئەوە ئەفشین ڕووبەڕووی بابەك بوویەوە و لەناوی برد.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو بوغای گەورە سامانێکی هێنابوو تا بەئەفشینی بسپێرێت. ئەفشین ئەم سامانەی لەناو هاوەڵانی دابەش کرد و دوای نەورۆز سوپای بۆ جەنگ ڕازاندەوە. ئەفشین، بوغای لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد تا گەمارۆ بخاتە سەر هەشتاسەر و جێگەی محەممەد کوڕی حومەید بگرێتەوە و لەوێ خەندەك هەڵکەنێت و بەهێزی بکات. بوغا بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێکەوت و ئەفشین لەبەرزەندەوە ملی ڕێگەی گرتەبەر و باوکی سەعید لەخەشەوە. هەرکام مەبەستی لەناوبردنی بابەکیان لەسەردا پەروەردە دەکرد. هەموویان لەشوێنێك بەناوی دەروەز لەدەوری یەك کۆبوونەوە. ئەفشین خەندەکی بەدەوری سوپاکەی هەڵکەند و دیوارێکی دروست کرد. شەش میل لەبەز دوور بوو.

بوغا بێ فەرمانی ئەفشین سوپاکەی خۆی ئامادە کرد. کەل و پەل و خواردەمەنی و سامانی هەڵگرت. لەهەشتا سەر تێپەڕی و ڕۆشتە جێگەی پێشوتری ئەفشین (بەز)، لەوێ ئوردووی لێدا کاروانی کا و ئالفی لەهەزاردا ڕەوانە کرد. دەستەیەك لەسوپاکەی بابەك هێرشیان کردەسەر و ئالفەکەیان فڕاند و کەسەکانیان کوشتار و ئەسیر کرد. بابەك دوان لەئەسیرەکانی ئازاد و بۆ لای ئەفشینی نارد تا لەچۆنیەتی ڕووداوەکە ئاگاداری بکەنەوە. (سەرکۆنەی دەکرد)

بوغا نیوە تێکشکاو بۆ خەندەکەکەی محەممەد کوڕی حومەید گەڕایەوە و ئەفشینی لەو ڕوداوە ئاگادار وداوای هاوکاری لێکرد. ئەفشین، فەزڵی برای و ئەحمەد کوڕی خەلیل کوڕی هوشام و کوڕی جەوشەن و جیناحی ئەعوەر (یەکچاو) فەرماندەی پاسەوانەکانی حەسەن کوڕی سەهل، کەخزمی دوو براکە حەسەن و فەزڵ کوڕی سەهل بوو، بۆ هاوکاری بوغا ڕەوانە کرد. ئەفشین نامەیەکی بۆ بوغا نووسی و فەرمانی پێدا لەو ڕۆژەی بۆی دیاریکردووە، بەمەبەستی جەنگ

پێشڕەوی بکات. ئەو ناوی ڕۆژی هێرشەکەی برد تا لەو ڕۆژەدا جەنگ دەستپێبکات. ئەفشین لەو ڕۆژە لەدەروەز بەمەبەستی جەنگی بابەك، لەخەندەکەکەی هاتەدەر. بوغا لەخەندەکەکەی هاتەدەر ورێگەی هەشتاسەری گرتەبەر. خەڵکان توانای بەرگەگرتنی سەرما و با یان نەبوو. بوغا بەناچاری بۆ لەشکرگەکەی خۆی گەڕایەوە و لەشوێنێك بەناوی ڕەبوە، ئوردووی لێدا. تۆفانێکی سەخت و باران بەخوڕ دەباری.

ڕۆژی دواتر ئەفشین دوای گەڕانەوەی بوغا جەنگی (بێ بوغا) دەست پێکرد و هێزەکانی بابەکی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشت و سەربازگە و خێوەت و ژنەکەی بابەکی گرت و لەناو ئوردووگاکەی دابەزی.

بەیانی ڕۆژی دواتر بوغا سوپای ڕازاندەوە و ڕۆشتە ناو هەشتاسەر، لەپێشیەوە ڕووبەڕووی سوپایەك بوویەوە کە لەشەڕی بابەك دەگەڕانەوە. داوای کەمێك لەکەرەستەکانی جەنگی ئەوانی کرد و لەهەشتا سەرەوە ڕێگەی بەزی گرتەبەر. پێشەنگی سوپای بەز، داوودە ڕەش بوو. بوغا پەیامی بۆ نارد: تا یەخەی گرتووین، سەربازەکان شەکەتن و گەشتوینەتە نیوەی ڕێگە، کێوێك دەستنیشان بکە کەدوژمن نەتوانێت بەئاسانی هێرش بکاتە سەرمان تا ئەمشەو لەوێ ئوردوو لێ بدەین. ئەوانی بردە کێوێك کەدەیانتوانی لەسەرەوە سەیری ئوردووەکەی ئەفشین بکەن. وتیان: شەو لێرە دەکەینە ڕۆژ و بەخواستی خوا، بەیانی هێرش دەکەینە سەر دوژمن. ئەو شەوە، هەور و سەرما و بەفر، زۆربەی بەشەکانی ئەو کێوەی گرتەوە بەشێوەیەك کەس نەیدەتوانی بێتەخوار و ئاو هەڵگرێت و لەبەر سەرمای سەخت، کەس نەیدەتوانی ئاو بەچوارپێکەی بدات. بەمشێوەیە سەرما و تەم و مژ دەستی پێکرد. بۆ ڕۆژی سێیەم، سوپاییەکان بەبوغایان وت: توێشو کۆتایی پێهات و سەرما لەناوی بردین؛ هەنووکە دەبێت کارێك بکەین، یا دەگەڕێینەوە یا هێرش دەکەینە سەر دوژمن.

بابەك لەو ڕۆژە تەم و مژاویی و سەرما و بەفر بارینەدا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر چەند بەشێکی ئوردووەکەی ئەفشین و ئەفشین بەناچاری بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە. بوغا تەپڵی جەنگی لێدا و ڕێگەی بەزی گرتەبەر و

نەیدەزانی ئەفشین چی بەسەر هاتووە. گومانی دەکرد ئەو لەشوێنەکەی خۆی ماوەتەوە. کاتێك هاتە ناو دۆڵەکە، ئاسمانی ساف و کەش و هەوای بەسازگار بینی. سوپاکەی خۆی رازاندەوە و رێگەی بەزی گرتەبەر. گەیشتە شوێنێك کەپەیوەستی کێوی بەز بوو. لێرەوە دووری نێوان بوغا و ماڵەکانی بەز، تەپۆڵکەکەی نیو میلی بوو.

کۆیلەکەی کوڕی بوعەیس لەناو پێشەنگەکانی سوپاکەی بوغا دەبینرا کەیەکێك لەخەڵکانی بەز بوو. پێشەنگەکانی بابەك رووبەروویان بوونەوە و مامی کۆیلەکە، ئەوی بینی و داوای لێکرد بگەڕێتەوە و فەرماندەی سوپاکەی ئاگادار بکاتەوە کەئەوان (سوپاکەی بابەك) سوپاکەی ئەفشینی لەناو بردووە و دەستیان بەسەر ئوردووەکەدا گرتووە و بۆ جەنگی ئێوە (دوو سوپا) خۆیان ئامادە کردووە. هەنووکە بەخێرایی بگەڕێنەوە ئەگەری هەیە تەندروست رزگارتان بێت.

کۆیلە گەڕایەوە و کوڕی بوعەیسی ئاگادار کردەوە. ئەویش بوغای ئاگادار کردەوە و لەگەڵ کەسە نزیکەکانی راوێژی کرد. دەستەیەك وتیان: ئەم قسەیەکی بێ هۆیە و لەفێڵێك زیاتر هیچی دیکە نییە، دەستەیەك وتیان: دەتوانین لەسەر لوتکەی کێوەکە ئوردووەکەی ئەفشین ببینین. ڕۆشتنە سەر لوتکەی کێوەکە بەڵام هیچ نیشانێکیان لەئوردووەکەی ئەفشین نەبینی و دڵنیا بوون لەوەی ئەفشین ئەو ناوچەی بەجێهێشتووە. دووبارە راوێژیان کرد و بەباشیان زانی پێش ئاوابوونی خۆر پاشەکشێ بکەن.

ئەوان بەخێرایی رێگەی گەڕانەوەیان گرتەبەر. لەرێگەی یەکەمەوە نەگەڕانەوە چوونکە رێگەیەکی پێچاوپێچ و دژوار بوو. بەناچاری بەدەوری هەشتاسەر سوڕانەوە. ئەمە تەنیا رێگەیەك بوو یەك پێچی تیا دەبینرا. سوپاییەکان لەترسی زۆر کەرەستەکانی جەنگیان فرێدایە ناو دۆڵەکە و بوغا لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکانب سوپا، لەدواوەی سوپاکە رێگەیان دەبڕی. پێشەنگەکانی بابەك رێگەیان لێدەگرتن لەکاتێکدا ژمارەیان لەدەکەس تێپەڕی نەدەکرد. بوغا دووبارە لەگەڵ هاورێکانی راوێژی کرد و وتی: دەترسم ئەم سوارانە بۆ فریودانی ئێمە دانرابێتن تا رێگە لەڕۆشتنی ئێمە بگرن و سەربازەکانی ئەوان بڕۆن و سەرە

ڕێگەکان بگرن. فەزڵ کوڕی کاوس وتی: ئەوان پیاوی ڕۆژ نین بەڵکو پیاوی شەون. دەبێت بۆ شەو لەوان بترسین. بەخێرایی ڕێگە دەبڕین و لەئەسپەکان دانابەزین تا لێرە ڕزگارمان دەبێت. کەسێك وتی: سوپاکە بڵاو بۆتەوە و سەرەتا و کۆتاییەکەی دیار نییە. سەربازەکان کەل و پەلی جەنگیان فڕێداوە، سامان و سوپا لەسەر پشتی ئێسترەکانە و دەترسین تاڵان بکرێن و ئەسیرەکانیان ئازاد بکەن.

منالی جاویدان لەدەستی ئەواندا ئەسیر بوو. بڕیاریاندا بوو بەهای ئازادییەکەی وەربگرن. بوغا لوتکەی کێوێکی هەڵبژارد و سەربازە شەکەت و ماندووەکان بێ هیچ تونشوێك لەوێ خێوەتیان هەڵدا. پاسەوانەکانی شەو پارێزگارییان لەڕێگەکان دەکرد بەلام بابەك لەقوڵێکی دیکەوە هێرشی کردەسەریان و بوغا و سوپاکەی گرفتار بوون. بوغا پیادە هاتەدەر و سواری یەکەم چوارپێ بوو. فەزڵ کوڕی کاوس بریندار بوو، جەناحی سەکری و کوڕی جەوشەن هەردووك کوژران و یەکێك لەو دوو برایەی خزمی فەزڵ کوڕی سەهل بوون، گرفتار بوون. بوغا و دەستەیەك لەهاوەڵانی ڕزگاریان بوو. سەربازەکانی بابەك شوێنیان نەکەوتن و سەرقاڵی کۆکردنەوەی سامان و تاڵانییە فراوانەکان بوون. سوپا پرژ و بڵاوەکە خۆیان گەیاندە لەشکرگە. بوغا بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەلەشکرگەکە مایەوە بەلام ئەفشین نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا بۆ مەراغە بگەڕێتەوە و بەڵێنیدا هاوکاری بۆ ڕەوانە بکات. بوغا ڕێگەی مەراغەی گرتەبەر. ئەفشین لەم ساڵەدا سوپاییەکانی دەستە دەستە لەقشلاق جێگیر کرد تا بەهار هات.

لەم ساڵەدا تەرخان، یەکێك لەگەورە سوپاسالارەکانی بابەك، کوژرا. هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو تەرخان داوای مۆڵەتی لەبابەك کرد تا زستان لەگوندەکەی خۆی لەدەوروبەری مەراغە بەسەر ببات. ئەفشین بۆسەی بۆ دانابوو. کاتێك هەواڵی تەرخانی پێگەیشت، کەسێکی بۆ لای تورك، موالی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لەمەراغە نارد و فەرمانی پێدا بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژێت یا ئەسیری بکات. تورك هێرشی کردەسەر و خوێنی ڕشت وسەری تەرخانی بۆ ئەفشین نارد.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا سەوڵ ئەرتەکین و شوێنکەوتەکانی کەژمارەیان دەگەیشتە دووسەد کەس، قۆڵبەست کراو گوێزرانەوە بۆ بەغداد لەکاتێکدا ئەوانیان لەسەر پشتی چوارپێکان دانیشاندبوو.

لەم ساڵدا ئەفشین لەرەجای حەزاری تورە و ئەوی قۆڵبەست کراو ڕەوانەی بەغداد کرد.

محەممەد کوڕی داود کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوالله کارگوزاری مەککە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا قازی ئەحمەد کوڕی موحریز، قازی قیروان، مرد.

لەم ساڵەدا ئادەم کوڕی باوکی ئەلیاسی عەسقەلانی لەماموٚستاکانی بوخاری لەصحیح و عیسا کوڕی ئەبان کوڕی سەدەقە باوکی موسا، قازی بەسرە ولەشوێنکەوتەکانی باوکی حەسەنی شەیبانی کەهاورێ و قوتابی باوکی حەنیفە و عەبدوالله کوڕی موسلیمە کوڕی قەعنەبی حارسی هاورێ و قوتابی مالك پێشەوای مەزهەبی مالکی و عەبدولکەبیر کوڕی موعافی کوڕی عیمرانی موسڵی کەپیاوێکی فرەزان بوو لەگەڵ عەباس کوڕی سەلیم کوڕی جەمیلی ئەزدی موسڵی، کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و دووی کۆچی ( ٨٣٦ زایینی )

## شەڕەکانی بابەك

لەم ساڵەدا موعتەسەم، جەعفەری خەیاتی (سوپاسالارە ناودارەکەی) بۆ هاوکاری ئەفشین ڕەوانە کرد و سی هەزار درهەمی بۆ خەرجی سوپا و خەرجییەکانی دیکە لەدەستی ئەیتاخی سوپاسالار نارد. ئەو، ئەم برە پارەی تەسلیمی ئەفشین کرد و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا جەنگی نێوان ئەفشین وسوپاسالارەکەی بابەك بەناوی ئازین دەستی پێکرد. هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو کاتێك زستانی ساڵی ٢٢١/٨٣٥ زایینی بەسەرچوو و بەهار هات. ساڵی ٢٢٢/ ٨٣٦ ئەفشین بەپێی وەرزەکە پێشڕەوی کرد و گەیشتە شوێنێك بەناوی کەلان ڕوود و لەوێ خەندەکی بەدەوری سوپاکەی هەڵکەند و نامەی بۆ باوکی سەعید نووسی کە لەبەرزەندەوە بەرەو گوندی کەلان ڕوود بڕوات. دووری ڕێگەی ئەو دوانە سی میل بوو.

ئەفشین پێنج ڕۆژ لەکەلان ڕوود مایەوە تا ئەوەی پەیکێك هەواڵی بۆ هێنا کەیەکێك لەسەرکردەکانی بابەك بەناوی ئازین لەبەرابەر ئەو سوپای ڕازاندۆتەوە وبنەماڵەکەی لەگەڵ ژمارەیەك سوپایی ڕەوانە کردووە. بابەك بەئازینی وت: باشترە بنەماڵەکەی خۆت لەیەکێك لەقەڵاکان بەجێبێڵیت تا لەئەماندا بن. ئازین وتی: من لەترسی جهود نابمە پیاوێکی قەڵانشین. (ئێرانییەکان لەو ڕۆژگارەدا ئەو کەسانەی تازە باوەڕیان بەئیسلام دەهێنا، بەجهود ناویان دەبردن و ئەوانیان بەریسوا و بێگانە لەقەڵەم دەدا). هەروەها وتی: سوێند بەخوا هیچ کات ئەوان ناخەمە چوار دیوارییەوە.

ئەفشین، زەفەر کوڕی عەلائی سەعدی لەگەڵ دەستەیەك سوار و پیادە ڕەوانە کرد. ئەوان شەو ڕێگەیان بڕی و گەیشتنە دۆڵێك کەدەبوا یەك لەدوای یەك ڕێگە بڕن. زۆربەی سەربازەکان جڵەوی چوارپێکانی خۆیانیان لەدەستا بوو. بەکێوەکەدا سەرکەوتن و بنەماڵەی ئازین و چەند لەمناڵەکانی ئەویان گرت.

ئازین ئاگادار بوویەوە. ئەفشین لەوە دەترسا کەریگەی کێوەکە بگرێت. ئەفشین

فەرمانی بەسوپاکەیدا لەسەر لوتکەی هەر کێوێك ئالآیەکی ڕەش هەڵبکەن و هەر کات هێزێکیان بینی و لێی ترسان، ئالآکان بشەکێننەوە. ئەوان فەرمانەکانی ئەفشینیان جێبەجێ دەکرد. کاتێك بنەماڵەی ئازینیان گرت و مەبەستی گەڕانەوەیان کرد و لەدۆڵەکە نزیك کەوتنەوە، ئازین و سوپاکەی ڕووبەڕوویان بوونەوە و جەنگیانە دژی سوپاکەی ئەفشین دەست پێکرد و ژمارەیەکیان لێ کوشتن و چەند ژنێکیان لەدەستی ئەوان رزگار کرد. ئەو سەربازانەی ئالآی ڕەشیان لەدەستا بوو، ئالآکانیان ڕاوەشاند. لەم کاتەدا ئازین دەستەیەکی نارد تا ڕێگەی ڕۆشتنیان لێ بگرن. کاتێك ئەفشین جووڵەی ئالآکانی بینی، دەستەیەکی بەفەرماندەیی موزەفەر کوڕی کیزەر ڕەوانە کرد. موزەفەر و بەدوای ئەو بوخارا خەزا بۆ جەنگی سوپاکەی ئازین ئەسپیان غاردا. کاتێك سوپاکەی ئازین سوپاکەی ئەفشینیان بینی، لەدۆڵەکە هاتنەدەر و پەیوەستی هاوەڵانیان بوون. زەفەر کوڕی عەلا و هاوڕێکانی چەندین ئەسیریان لەدەستی ئەوان رزگار کرد.

## گرتنی بەز و قۆڵبەست کردنی بابەك

لەم ساڵەدا بەز، شارەکەی بابەك دەستی بەسەردا گیرا و موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شارەکە و وێرانیان کرد و ئەوەی لەناو شارەکەدا بوو، بەڕەوایان زانی. ئەم پێشهاتە لەبیستی ڕەمەزان ڕوویدا.

چۆنیەتییەکەی بەمشێوە بوو: کاتێك ئەفشین مەبەستی نزیك بوونەوە لەبەز و گوزەر کردن لەکەلان ڕوودی کرد، بەپێچەوانەی رابردوو هێدی هێدی دەڕۆشتە پێش. موعتەسەمیش نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا سوپاکە بکاتە دەستە دەستە تا بەنۆرە کێشك بگرن بۆ ئەوەی گرفتاری هێرشی لەناکاوی شەوانە نەبن. ئەفشین ئەم کارەی کرد بەلآم سوپاییەکان شەکەت و سکالآیان بەرز کردەوە، وتیان: لەنێوان ئێمە و دوژمن چوار فەرسەخ دوورییە بەلآم بەشێوەیەك دەجوڵێینەوە وەك بڵێی لەبەرابەر ئێمەدا بن، ئێمە شەرم لەخەڵکان دەکەین، شەڕ دەست پێبکە، دەرئەنجامەکەی شکست یا سەرکەوتن بێت، گرنگ نییە.

ئەفشین وتی: دەزانم وتەکانی ئێوە ڕاستە بەلآم ئەوە فەرمانی سەرووەری

باوەڕدارانە. زۆری نەخایاند نامەیەکی موعتەسەمی بەدەست گەیشت کەچۆنی پێ باشە، ئەوە بکات و چەند رۆژێکی بەمشێوەیە بەسەر برد تا ئەوەی گەیشتە رودرود و تا نزیك ئەو جێگە پێشڕەوی کرد کەساڵی پار گۆڕەپانی جەنگی بوو. لەوێ ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی بابەکی بینی بەڵام جەنگی دەست پێنەکرد و تا نیمەڕۆ چاوەڕوان بوو. دواتر بۆ ئوردووەکەی گەڕایەوە و دوو رۆژ مایەوە و ئەمجارە لەگەڵ ژمارەیەکی زیاتر شەڕکەر گەڕایەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خۆی لەجەنگ بەدوور گرت. ئەفشین لەرودرود مایەوە و فەرمانی بەپاسەوانانی کێوەکاندا لوتکەی کێوەکان بگەڕێن بۆ ئەوەی شوێنێکی بەهێز و خۆڕاگر بۆ هێزە پیادەکان بدۆزنەوە. ئەوان سێ کێویان هەڵبژارد کەچەندین قەڵای وێرانەی تیا دەبینرا. ئەفشین ژمارەیەك کرێکاری لەگەڵ خۆی بردە سەر ئەو کێوانە و بڕێك نانی وشك وئارد و شیری پێدان و فەرمانی بەکرێکارەکاندا تا ئەو کاتەی رێگەی کێوەکە دەگرن، بەرد ببەن و بەمشێوەیە شوێنێکی هاوشێوەی قەڵای دروست کرد. فەرمانیدا لەسەر هەر رێگەیەك لەپشت بەردەکانەوە خەندەك هەڵکەنن و تەنیا یەك رێگە بۆ گەیشتن بەلوتکەی کێوەکە بهێڵنەوە. ئەو لەماوەی دەرۆژ کاری هەڵکەندنی خەندەکانی کۆتایی پێهێنا. خۆی وسەربازەکانی شەوانەرۆژ کرێکاران و هێزە پیادەکانیان لەژێرچاودێریدا بوو.

کاتێك ئەفشین کۆتایی بەم کارە هێنا، هەموانی بردە ئەوێ. بابەك نوێنەرێکی نارد و چەند بارێك خەیار و کاڵك و شوتی پێدا و نێردراو بەئەفشینی وت: بابەك لەوەی دەیبینی ئەوان ناچارن شەو و رۆژ نانی وشك بخۆن، بێزار بووە و ئەوەی کەڕەوا نییە ئێوە بەو شێوە بژین و ئێمە لەئاسوودەییدا شەو بکەینە رۆژ. ئەفشین دیارییەکانی وەرگرت و وتی: دەزانم براکەم بەدوای چیدا دەگەڕێت، نێردراوەکەی بردە سەر کێوەکە و کارەکانی خۆیانی نیشاندا، نێردراوی بەسەر خەندەکەکاندا گێڕا و وتی: هەنووکە بڕۆ و بابەك لەم کارانە ئاگادار بکەرەوە.

دەستەیەك لەسەربازەکانی بابەك دەهاتنە لای قەڵاکان و هاواریان دەکرد. ئەفشین مۆڵەتی نەدا کەس هێرش بکاتە سەریان. سوپاکەی بابەك تا سێ رۆژ ئەم کارەیان دووبارە کردەوە.، دواتر ئەفشین فەرمانی بەدەستەیەك لەسوپاکەیدا

بۆسەیان بۆ بنێنەوە. ئەمجارە کاتێك گەڕانەوە، سوپاکەی ئەفشین هێرشیان کردنەسەر. هێزەکانی بابەك هەڵاتن و چیتر نەگەڕانەوە.

ئەفشین هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و فەرمانی پێدان هەرکام پارێزگاری لەشوێنەکانی خۆیان بکەن. خۆی بەسواری بەناو سوپاکەدا دەگەڕا. دواتر دەنگی تەپڵەکان بەرز دەبوویەوە و فەرمانی دەدا. هێرشی ئەو بەهۆی فراوانی سەربازەکان هاوڕێ بوو لەگەڵ لێدانی تەپڵەکان و لەناو ریزەکاندا دۆڵ و دەشتەکانیان دەبڕی. هەرکاتێك پێشڕەوییان دەکرد، تەپڵیان لێدەدا و هەرکات دەوەستان، دەستیان لەلێدانی تەپڵ هەڵدەگرت. بەمشێوەیە سەربازەکان یا پێشڕەوییان دەکرد یا دەوەستان. هەموان هەنگاوی کورتیان هەڵدەگرت تا ئەو جێگەی پاسەوانانی کێو بەهێنانی هەواڵێك ریگەی ڕۆشتنی لێ دەگرتن یا فەرمانی پێشڕەوی پێ دەدان.

ئەفشین، کاتێك مەبەستی ئەوەی کرد بڕواتە ناو گۆڕەپانی ساڵی پار، بوخارا خەزاهی لەگەڵ هەزار سوار و شەشسەد پیادە وەك فەرمانده‌ی پاشکۆی سوپاکە دیاریکرد بۆ ئەوەی ئاگایان لەدواوە بێت نەکا سوپاکەی بابەك هێرشیان بکەنەسەر.

بابەك کاتێك لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، دەستەیەك لەهێزەکانی خۆی ڕەوانە کرد تا لەدۆڵی ئەم ڕێگە دژوارە سەنگەر بگرن و خۆیان حەشار بدەن. ئەم جێگەیە لەژێر شوێنێکەوە بوو کەبوخارا خەزا لێوەی گوزەری دەکرد. ئەفشین هەوڵیدا شوێنە هەستیارەکانی بابەك بدۆزێتەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. ئەفشین، فەرمانی بەباوکی سەعیددا لەگەڵ دەستەیەك لەبیابانێکەوە گوزەر بکەن و فەرمانی بەجەعفەری خەیاتدا لەبیابانێکی دیکەدا بگەڕێت بەهەمان شێوە کەئەحمەد کوڕی خەلیل کوڕی هوشامی ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی لەبیابانێکی دیکەدا بگەڕێن. ئەم سییانە ڕۆشتنە پێش تا گەیشتنە ئەو شوێنەی ماڵی شوێنکەوتەکانی بابەك لەوێ دروست کرابوو. بابەك سوپاکەی خۆی لەم بیابانەدا ئامادە کرد تا سەربازێك لەسوپاکەی ئەفشین نەتوانێت لەدەروازەی بەز نزیك ببێتەوە. ئەو سوپاکەی خۆی دەشاردەوە و تەنیا ژمارەیەکی کەمی ئەوانی نیشان دەدا.

ئەفشین لەسەر تەپۆڵکەیەك دانیشتبوو کەدەیڕوانییە سەر کۆشکەکەی بابەك و چاودێری دەستەی شەڕکەرانی ئەوی دەکرد. سوارەکانی ئەم بەشە لەدەشت

لەچوارپێکانی خۆیان دەهاتنە خوار بەڵام سوارەکانی هاورێی باوکی سەعید و جەعفەر و ئەحمەد کوڕی خەلیل بۆ نزیك بوونەوە لەدوژمن، لەئەسپەکانیان دانەدەبەزین. بابەك و سوپاکەی دەیانخواردەوە و زۆرنایان دەژەنی. کاتێك ئەفشین نوێژی نیمەڕۆی دەخوێند بۆ شوێنەکەی خۆی لەرودرود دەگەڕایەوە. سوپاییەکان دەستە دەستە نوێژیان دەخوێند و دەگەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. هەردەستەیەك کەشوێنەکەی چۆڵ دەکرد، بەدەستەیەکی دیکەی دەسپارد و دوایین کەس کەدەڕۆشت و دەگەڕایەوە، بوخارا خەزا بوو چوونکە دوورترین کەس لەدوژمن و کاتێك دەگەڕایەوە بابەکییەکان لەبەرابەر ئەو، دەنگی هاواریان بەرز دەکردەوە.

لەیەکێك لەرۆژەکان کەسوپاکەی بابەك بێزار ببوون و ئەفشین هاوشێوەی رابردوو گەڕابوویەوە و دەستەکانی ئەم بەشە لەدۆڵەکە گەڕابوونەوە و جگە لەجەعفەری خەیات کەس نەمابوویەوە، سوپاکەی بابەك دەروازەی بەزیان کردەوە و دەستەیەك لەوان هێرشیان کردە سەر جەعفەر و دەنگەدەنگ بەرز بوویەوە. جەعفەر خۆی هەنگاوی بردە پێش و پاشەکشێی بەسوپاکەی بابەك کرد و لەئوردووگاکە دەنگەدەنگ بەرز بوویەوە. ئەفشین گەڕایەوە و بینی جەعفەر و هاورێکانی سەرقاڵی جەنگن. دەستەیەك لەهەر دوو سوپا هاتنەدەر، ئەفشین لەسەر چوارپێکەی خۆی دانیشت، ئەنگوستی تورەیی دەگەست و بەخۆی دەوت: بارودۆخی سوپاکەی منی شێواند ( بۆ جەعفەر لەشوێنەکەی خۆی هاتەدەر و هێرشی برد). دەنگەدەنگ بەرز بوویەوە. باوکی دۆلف لەگەڵ دەستەیەك خۆبەخش بێ وەرگرتنی مۆڵەتی ئەفشین بۆ هاوکاری جەعفەر ئەسپی غاردا. ئەوان خۆیان گەیاندە دەروازەی بەز و گورزێکی کاریگەریان لەدەروازەکەدا. ئەوەندەی نەمابوو دەروازەکە بکەنەوە و بڕۆنە ناو شاری بەز. جەعفەر پەیکی بۆ لای ئەفشین نارد تا پەنجا پیادەی تیرهاوێژ بۆ هاوکاری کردن ڕەوانە بکات. دیوت: هیوادارە بڕواتە ناو شاری بەز. ئەفشین پەیامی بۆ نارد کەتۆ کارەکانی منت بەفیڕۆدا، هێواش هێواش خۆت و هاورێکانت رزگار بکە و بگەڕێرەوە. لەم کاتەدا دەنگی خۆبەخشەکان بەرز بوویەوە تا ئەو جێگەی خۆیان بەدار و دیواری دەرگاکەوە هەڵواسی و سەربازەکانی بابەك

گومانیان کرد جەنگی گشتی لەبەز دەستی پێکردووە و لەبەر ئەمە سەرەتا هێرشیان کردە سەر هێزەکانی بوخارا خەزا و دەستەیەکی دیکە لەقۆڵێکی دیکەوە هێرشیان برد. لەم کاتەدا سەربازەکانی بابەك لەشوێنەکانی خۆیان هاتنەدەر بەڵام هیچ کام لەسەربازەکانی ئەفشین لەشوێنی خۆیان نەجووڵان. ئەفشین وتی: سپاس بۆ خوا کەشوێنی سەربازەکانی بۆ ئاشکرا کردین.

جەعفەر هاورێ لەگەڵ هاورێیان و هێزە خۆبەخشەکان بۆ لای ئەفشین گەڕانەوە. جەعفەر لەهاوکاری نەکردنی ئەفشین گلەیی کرد و لەنێوان ئەوان دەمەبۆڵە هاتە ئاراوە. یەکێك لەخۆبەخشەکان کەبەردێکی بەدەستەوە بوو، هاتە پێش و بەئەفشینی وت: ئایا لەکاتێکدا فەرمانی پاشەکشێ بەئێمە دەدەیت کەئەم بەردەم لەدیواری بەز کردەوە؟ ئەفشین لەوەڵامدا وتی: کاتی گەڕانەوە، ئەوەی لەسەر ڕێگەکەت حەشاردراوە، دەبینیت (ئەو هێزانەی لای بوخارا خەزا کەمینیان کردبوو) دواتر بەجەعفەری وت: ئەگەر ئەو کەسانەی لەپشت سەر و لەژێر قاچی تۆ خۆیان حەشاردابوو، هێرشیان دەبرد، تۆ لەگەڵ ئەم هێزە خۆبەخشە خۆسەرانە چیت دەکرد؟

لەم کاتەدا بارودۆخی نێوان ئەفشین و سوپاکەی هێور بوویەوە. کاتێك سوپاییەکان لەشوێنی سەربازەکانی بابەك ئاگادار بوونەوە و هەستیان بەوە کرد ئەگەر بوخارا خەزا شوێنەکەی خۆی بەجێدەهێشت، لەناو دەچوون و هیچ موسوڵمانێك بەزیندووی ڕزگاری نەدەبوو، زانییان ئەفشین کارێکی چاکی کردووە کە لەشوێنەکەی نەجووڵاوە. ئەفشین چەند ڕۆژێك لەخەندەکەکەی مایەوە تا ئەوەی هێزە خۆبەخشەکان لەکەمی ئالف و توێشوو بێزار بوون. ئەفشین وتی: هەرکەس خۆڕاگری دەکات، خۆڕاگری بکات و هەرکەس خۆڕاگری ناکات، ڕێگە ئاوەڵا و جادەی گەڕانەوە درێژە و تەنیا سوپای سەروەری باوەڕداران بۆ ئێمە بەسە (پێویستمان بەهێزە خۆبەخشەکان نییە) هێزە خۆبەخشەکان لەکاتی گەڕانەوە بەخۆیان دەوت: ئەگەر ئەفشین ڕێگەی لەئێمە و جەعفەر نەدەگرت، دەمانتوانی دەست بەسەر بەزدا بگرین تا ئەو جێگەی یەك لەوان دەیوت: پێغەمبەرم لەخەودا بینی کەدەیفەرموو: بەئەفشین بڵێ باشترە بەشێوەیەکی باش و بوێر لەم جەنگەدا

هەوڵ بدەیت وەگەرنە فەرمان بەکێوەکان دەدەم بەردبارانت بکەن. ئەم خەوەی لەناو خەڵکدا گێڕایەوە و ئەفشین بیستی. ئەفشین پیاوەکەی بانگ کرد و سەبارەت بەخەوەکەی پرسی. ئەویش خەوەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەفشین وتی: خواوەند لەمەبەستی من کەپاراستنی گیانی خەڵکانە، ئاگادارە، ئەگەر خواوەند فەرمان بەکێوەکان بدات بۆ ئەوەی کەسێك بەردباران بکەن، باشترە ئەم کافرە (بابەك) بەردباران و ئێمە لەشەڕی ئەو ئاسوودە بکەن.

یەکێك لەخۆبەخشەکان وتی: ئەی ئەمیر، بەهرەی شەهادەت لەئێمە مەستێنە چوونکە بەدوای پاداشتی خواییدا دەگەڕێین. مۆڵەتمان پێبدە خۆمان بڕۆینە گۆڕەپان ئەگەری هەیە خواوەند شەهادەتمان پێ ببەخشێت. ئەفشین وتی: دەبینم ئامادەن و گومان دەکەم ئەمە خواستی خواوەندە و هیچ شتێك بێ فەرمانی ئەو نییە. لەئێستادا بارودۆخی ئێوە بەشێوازێکی دیکەیە. بۆچوونی من بەو شێوە نەبوو بەڵام بەبیستنی ئەم قسانە گۆڕانی بەسەرهات. بڕۆنە پێش و ڕۆژێك دیاری بکەن تا روو لەگۆڕەپان بکەین و هیچ هێزێك گەورەتر لەهێزی خواوەند نییە.

ئەوان دەم بەبزە هاتنەدەر و تەنیا ئەو کەسانە کشانەوە کەخوازیاری گەڕانەوە بوون. ئەفشین ڕۆژێکی بۆ سەربازەکان دیاری کرد و فەرمانی پێدان ریز ببەستن و خواردەمەنی و توێشو و ئاو هەڵبگرن. گویزەروەکانی لەسەر پشتی ئێسترەکان دانا تا بریندارەکانی پێ بگوازنەوە. لەو ڕۆژەدا پێشڕەوی بەسوپا کرد. بوخارا خەزا فەرماندەی پاشکۆی سوپاکە بوو. ئەفشین لەشوێنی هەمیشەیی دانیشت و بەباوکی دۆلفی وت: بەخۆبەخشەکان بڵێ ئاسانترین شوێن بۆ جەنگ هەڵبژێرن. دواتر بەجەعفەری وت: هەموو سوپا لەتیرهاوێژەکان تا نەوت هەڵگرەکان لەژێر فەرمانی تۆدان، هەرئەندازە هێز کەدەخوازیت، هەڵبژێرە و بەخواستی خواوەند پێشڕەوی بکە و بۆ هەر شوێنێك، دەخوازی بڕۆ.

جەعفەر ڕۆشتە شوێنەکەی جارانی. ئەفشین بەباوکی سەعیدی وت: تۆ و سوپاکەت لەنزیك من بن، بەئەحمەد کوڕی خەلیلی وت: تۆ لەم شوێنەدا بمێنەرەوە و ئەگەر جەعفەر داوای هێزی هاوکاری کرد، بەهێز هاوکارییان دەکەین.

جەعفەر و هێزە خۆبەخشەکان پێشڕەوییان کرد و جەنگان تا ئەوەی توانیان

خۆیان بەدیواری بەز بگەیێنن. جەعفەر دەروازەی بەزی وێران کرد و لەوێ دەجەنگی، ئەفشین بۆ ئەو و هێزە خۆبەخشەکان درهەم و دیناری دەنارد تا لەناو ئەو کەسانەی پێشڕەوییان دەکرد، دابەشی بکەن. ئەفشین بەکرێکارە تەور بەدەستەکان هاوکاری دەکردن. بەردەوام ئاوی بۆ دەناردن بۆ ئەوەی تینویەتی بەرۆکیان نەگرێت هەروەها نانی وشك و ئارد و شیری بۆ دەناردن. لەکەنار دەروازەکە جەنگێکی قورس هەڵگیرسا و سوپاکەی بابەك دەروازەکەیان کردەوە و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی جەعفەر و پاشەکشێیان پێکردن. لەقوڵێکی دیکەوە تەنگیان بەهێزە خۆبەخشەکان هەڵچنی و لەسەر دیوارەکەوە بەردبارانیان کردن. ئەم گوشارانە کاریگەری لەسەر ئەوان بەجێهێشت و لاوازی کردن. جەعفەر سەد پیاوی لەسەربازەکانی هەڵبژارد و لەپشت قەڵغانەکانەوە جێگیری کردن بۆ ئەوەی نەدوژمن بتوانێت پێشڕەوی بکات و نەخۆیان هێرش بکەنە سەر دوژمن. بەم شێوە بەردەوام بوو تا ئەوەی نوێژی نیمەڕۆیان خوێند. ئەفشین پیادەکانی خۆی بۆ هاوکاری هێزە خۆبەخشەکان ڕەوانە کرد و چەند کەس لەوانی بۆ هاوکاری جەعفەر نارد بۆ ئەوەی دوژمن بیر لەکوشتنی ئەو نەکاتەوە. جەعفەر وتی: ژمارەی هێزەکانم کەم نییە بەڵام شوێنێك لەم گۆڕەپانەدا نابینم بتوانم پێشڕەوی بەسوپاکەم بکەم. فەرمانی گەڕانەوەیدا و خۆی گەڕایەوە.

ئەفشین بریندارەکانی خستە سەر تەختە گوێزەرەوەکان و تەختەکانی خستە سەر پشتی ئێسترەکان و گەڕایەوە. سەربازەکان لەمساڵەدا لەگرتنی بەز بێ هیوا بوون و زۆرینەی هێزە خۆبەخشەکان گەڕانەوە.

ئەفشین دوو حەفتە دواتر سوپاکەی ڕازاندەوە و لەکاتی شەودا هەزار تیرهاوێژی ئامادە کرد. بەهەرکام مەشکەی ئاو و نانی وشکیدا و ئاڵاکانی بەوان سپارد و ڕێنیشاندەرەکانی کردە هاورێیان. ئەوان لەکوێستانە نەناسراوەکان ڕێگەیان بڕی و گەیشتنە پشت تەپۆڵکەیەك کەئازین لەوێ بوو. ئەم شوێنە، کێوێکی بڵند بوو. ئەفشین فەرمانی پێدان خۆیان نیشان کەس نەدەن تا ئەو کاتەی ئاڵاکانی ئەفشین دەبینن. کاتێك ئاڵاکانی ئەفشینیان بینی کە لەسەر ڕمەکان هەڵکراون و تەپڵ ژەنەکان لەکێوە هاتنەخوار، بەتیر و بەرد هێرشیان کردە سەر

سوپاکەی بابەك. بڕیار بوو تا ئاڵاکانی ئەفشین نەبینن تا هەواڵێك لەوان بگات، لەشوێنی خۆیان نەجوڵێن. ئەم کارەیان کرد تا ئەوەی لەبەرەبەیان گەشتنە لوتکەی کێوەکە و لەبەشێکی شەو ئەفشین پەیکی بۆ لای سەربازەکانی دیکە نارد و فەرمانی ئامادە بوون بۆ جەنگی پێدان.

دوای تێپەڕینی بەشێك لەشەو، بەشیری تورك و چەندین سەردار لەفەرغانە کەهاوڕێی ئەفشین بوون، فەرمانیان پێدرا لەژێر ئەو تەپۆڵکانەوە ڕێگە بېڕن کەئازین سەنگەری گرتبوو. ئەفشین دەیزانی بابەك لەژێر ئەو تەپۆڵکەدا خۆی حەشارداوە. ئەوان لەشەودا ملی ڕێگەیان گرتەبەر. سوپاکەی بابەك لەم پێشهاتانە ئاگادار نەبوون. ئەفشین و سەربازەکان لەبەرەبەیاندا ئاڵاکانیان بەنوکی ڕمەکان بەرز کردەوە و تەپڵیان لێدا. ئەفشین سوار ئەسپەکەی بوو، خۆی گەیاندە گۆڕەپان و لەشوێنی هەمیشەیی لەسەر چوارپایەکەی دانیشت. فەرمانی بەبوخارا خەزادا لەگەڵ جەعفەری خەیات و باوکی سەعید و ئەحمەد کوڕی خەلیل کوڕی هوشام لەو شوێنەی ئەو جێگیر دەبوو، دابەزن. ئەم کارە بووە هۆی سەرسوڕمانی خەڵکان. ئەفشین فەرمانیدا لەو تەپۆڵکەی ئازین سەنگەری گرتبوو، نزیك ببنەوە و دەوری بگرن لەکاتێکدا پێشتر ڕێگەی نزیك بوونەوە لەو تەپۆڵکەی لێدەگرتن.

سوپاییەکان لەگەڵ ئەم چوار سەردارە بەرەو تەپۆڵکەکەی ئازین بەرێکەوتن. جەعفەری خەیات ڕێگەی ڕۆشتنە ناوەوەی گرت. باوکی سەعید هاوڕێیەتی دەکرد، لای باوکی سەعید، بوخارا خەزا و ئەحمەد لای بوخارا خەزا جێگیر بوو. هەموویان دەوری تەپۆڵکەکەیان گرت و لەم کاتەدا دەنگەدەنگێك لەبەشی خوارەوەی دۆڵەکە دروست بوو. سوپاکەی بابەك هێرشیان کردە سەر بەشیری تورك و سەردارەکانی فەرغانە و شەڕیان دەستپێکرد. سەربازەکان دەنگی ئەوانیان بیست و کاتێك مەبەستی هاوکاری کردنی ئەوانیان کرد، ئەفشین دەنگی بەرز کردەوە کە سوپاکەی بابەك هێرشیان کردۆتە سەر بەشیری تورك (بەشیری تورك سوپاکەی بابەکی هانداوە) کەس لەشوێنەکەی خۆی نەجووڵێت. کەس نەجووڵا و هەموان لەشوێنی خۆیان وەستان. کاتێك پیادە تیرهاوێژەکان کە بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتبوونە سەر بەرزایی کێوەکە، لەنزیك بوونەوەی سوپا ئاگادار بوونەوە و ئاڵاکانیان

بەرمەکان بەرز کردەوە. سوپاییەکان بینیان ئاڵاکان لەگەڵ ژمارەیەك لەسەربازەکان لەکێوەکە دێنەخوار و بەرەو سوپاکەی ئازین دەڕۆن. ئازین دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد.

جەعفەر و سوپاکەی هێرشیان کردە سەر ئازین و سوپاکەی و بەهێرشێکی ماڵوێرانکەر، ئازین و سەربازەکانییان بەرەو دۆڵەکە برد. دەستەیەك لەسەربازەکانی باوکی سەعید هێرشیان کردە سەر ئازین بەلام لەناکاو هەستیان کرد سمی ئەسپەکان لەچاڵەکان دەچەقێت و دەکەون. ئەفشین دەستبەجێ کرێکارەکانی نارد تا چاڵەکان پڕ بکەنەوە. کرێکارەکان چاڵەکانیان پڕ کردەوە و بەمشێوەیە توانیان گورزێکی کوشندە لەسوپاکەی بابەك بدەن.

ئازین لەسەرەوەی کێوەکە عارەبانەیەکی دانابوو و بەهۆیەوە سوپاکەی ئەفشینی بەردباران دەکرد. کاتێك سەربازەکانی ئەفشین هێرشیان کردەسەر، عارەبانەکەی هێنایە پێش. سەربازەکان ڕێگەیان بۆ کردەوە. سەربازەکانی ئەفشین لەهەموو قۆڵەکانەوە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی بابەك. کاتێك بابەك زانی سوپاکەی دەوری گیراوە، لەبەز هاتەدەر و بەرەو جێگەی ئەفشین ئەسپی غاردا. ئەفشینیان ئاگادار کردەوە کەبابەك مەبەستی تۆی هەیە. ئەفشین بەرادەیەك لێی نزیك بوویەوە کەدەنگی خۆی و سەربازەکانی دەبیست. جەنگ لەشوێنەکەی ئازین تەشەنەی سەند. بابەك وتی: ئەمانم لەسەروەری باوەڕداران دەوێت. ئەفشین وتی: ئەمانت پێ دەبەخشم و هەرکات بخوازیت، ئەمانت هەیە. بابەك وتی: هەنووکە دەخوازم کەمێك پاشەکشێ بکەیت تا بنەماڵەکەم هەڵگرم و خۆم ئامادە بکەم. ئەفشین وتی: ئامۆژگاریت دەکەم ئەمڕۆ ملکەچی خۆت نیشان بدەیت باشترە لەسبەی. بابەك وتی: ڕازیم. ئەفشین وتی: کەواتە بارمتەکان ڕەوانە بکە. بابەك وتی: ئەو کارە دەکەم بەلام فلان کەس و فیسارە کەس لەسەر ئەو تەپۆڵکەن، فەرمان بەسەربازەکانت بدە دەست رابگرن. نوێنەری ئەفشین بەرێکەوت تا فەرمانی وەستانی جەنگ بەسوپاییەکان بدات. پێی وترا ئێستا ئاڵای سەردارەکانی فەرغانە ڕۆشتە ناو شاری بەز و لەسەر بانی ماڵەکان هەڵکراون. لەم کاتەدا ئەفشین سوار ئەسپەکەی بوو و ڕۆشتە ناو شاری بەز. سەربازەکان ڕۆشتنە ناو شارەکە و

ئالاّكانیان لەسەر كۆشكەكان هەڵكرد. ژمارەی كۆشكەكان چوار دانە بوو كەشەشسەد كەس لەوێدا بۆ جەنگ ئامادە بوون. كەسانی ناو كۆشكەكان هاتنەدەر و جەنگیان دەست پێكرد. بەمشێوەیە بابەك توانی بڕوات و خۆی بگەیێنێتە دۆڵی ڕووبەڕووی هەشتاسەر. ئەفشین و سوپاكەی سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ جەنگاوەرانی ناو كۆشكەكان بوون. ئەفشین نەوت هەڵگرەكانی هێنا و گڕی بەردایە كۆشكەكان. خەڵكان ڕژانە ناو كۆشكەكان و تا دواین كەسی سەربازەكانی بابەكیان كوشت. ئەفشین ژن و مناڵەكانی بابەكی وەك بارمتە گرت و تا ئێواریٚ لەویٚ مایەوە. دواتر فەرمانی گەڕانەوەی بەسەربازەكاندا و بۆ ڕودرود گەڕانەوە.

دوای ئەوەی ئەفشین لەبەز گەڕایەوە، بابەك و هاورێكانی گەڕانەوە بۆ ناو شارەكە و تا ئەو جێگەی دەیتوانی، خۆراك و كەل و پەلی هەڵگرت. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە ئەفشین هاتە بەز و فەرمانیدا پاشماوەی كۆشكەكان وێران بكەن. ئەو كارەیان كرد و تەنانەت یەك ژووریان نەهێشتەوە. نامەیەكی بۆ فەرمانڕەوای ئەرمەنستان و سوپاسالارەكان نووسی و ئەوانی ئاگادار كردەوە كەبابەك و ژمارەیەك لەسوپاكەی هەڵاتوون و لەسەرزەمینی ئێوە گوزەریان كردووە. فەرمانی پێدان پارێزگاری لەسەرزەمینەكەی خۆیان بكەن بەشێوەیەك كەس لەسەرزەمینی ئەوان گوزەر نەكات تا دەیناسنەوە.

سیخوڕەكانی ئەفشین لەشوێنی مانەوەی بابەك ئاگاداریان كردەوە. ئەم شوێنە لەدۆڵێكدا پڕ دار و گیادا بوو كە لەلایەك دەگەیشتە ئازەربایەجان و لەلایەكی دیكە بەئەرمەنستان. سوپا نەیدەتوانی لەویٚ ئوردوو لێبدات و ئەگەر كەسێك لەویٚ خۆی دەشاردەوە لەبەر فراوانی دارو گیا، دۆزینەوەی ئاسان نەبوو. ئەم دۆڵەیان بە (غیضە) ناو دەبرد. ئەفشین لەسەر ڕێگەكانی گەیشتن بەم دۆڵە دەستەیەك لەسەربازەكانی جێگیر كرد تا چاودێری ڕێگەكە بكەن. ژمارەی ئەم دەستانە پانزە كەس بوون.

لەم كاتەدا ئەمان نامەی موعتەسەم بۆ بابەك گەیشت. ئەفشین چەند كەسێك لەشوێنەكەوتەكانی بابەكی بانگ كرد و ئاگاداری كردنەوە و وتی نامەكە بۆ بابەك ببەن. یەكێك لەوان كوڕەكەی بابەك بوو. كەس لەترسی بابەك نەیتوانی نامەكەی بۆ

ببات. ئەفشین وتی: بابەك لەم ئەمان نامە شادمان دەبێت. وتیان: ئێمە ئەو لەتۆ باشتر دەناسین. لەم کاتەدا دوو پیاو هەستان و بەئەفشینیان وت: تۆ بەڵێن بدە بنەماڵەکەی ئێمە پشتگوێ ناخەیت ئێمەیش بەڵێن دەدەین نامەکەی بۆ ببەین. کاتێك ئەو دوانە گەیشتنە لای بابەك، ئەویان لەئەمان نامەکە ئاگادار کردەوە. بابەك یەك لەو دوو کەسەی کوشت و فەرمانی بەوەی دیکەدا نامەکە بۆ ئەفشین بگەڕێنێتەوە.

کوڕەکەی بابەك نامەیەکی بەم دوو پیاوەدا ناردبوو تا بەدەستی باوکی بگات. بابەك بەو پیاوەدا پەیامی نارد: بەو رووسپی زادە بڵێ (کوڕەکەی خۆی) ئەگەر کوڕی من دەبویت، پەیوەستی من دەبوویت بەڵام تۆ کوڕی من نیت، ئەگەر یەك رۆژ بژیت و ریبەرێکی چاکەکار بیت باشترە لەوەی چل ساڵ هاوشێوەی شوانێکی کۆیلە ژیان بەسەر ببەیت. بابەك لەشوێنەکەی خۆی لەو جەنگەڵەدا مایەوە تا ئەو کاتەی خواردنی کۆتایی هات و سەرئەنجام یەکێك لەرێگەکانی گرتەبەر و لەجەنگەڵەکە هاتەدەر. لەم کاتەدا تەنیا چوار کەس پارێزگارییان لەو رێگەیە دەکرد و پاسەوانەکانی دیکە کەمێك دوورتر بوون.

رۆژ لەنیوە تێپەڕیبوو کەبابەك و هاورێیانی لەجەنگەڵەکە هاتنەدەر. ئەوان سەربازەکانی سەر رێگەیان نەبینی. بابەك گومانی کرد کەسی لێ نییە و لەبەر ئەمە هاوریێ لەگەڵ عەبدوڵلەی برای؛ معاویە، دایکی و ژنێکی دیکە هاتنەدەر و رێگەی ئەرمەنستانیان گرتەبەر. پاسەوانەکان ئەوانیان بینی و پەیکیان بۆ لای سەربازەکان نارد: چەندین سوار دەبینین بەڵام نازنین کێن. باوکی ساج فەرماندەی ئەم دەستەیە بوو. هەموویان سوار بوون و بەرەو کەسە نەناسراوەکان رۆشتن. بینیان بابەك و هاورێیانی لەئەسپەکانیان هاتوونەتەخوار و خواردن دەخۆن. کاتێك بابەك و هاورێکانی سەربازەکانیان بینی، پەڕینە سەر ئەسپەکان و لەناو ئەوان تەنیا بابەك رزگاری بوو. دایکی بابەك و ئەو ژنەی تر گرفتار بوون. باوکی ساج ئەوانی بۆ لای ئەفشین نارد.

بابەك لەکوێستانەکانی ئەرمەنستان خۆی شاردەوە تا ئەوەی خواردنی پێ نەما. فەرمانڕەواکانی ئەرمەنستان پارێزگاری سنور و کەنارەکانیان دەکرد و فەرمانیاندا بوو کەس لەسنوور نەپەڕێتەوە مەگەر ئەوەی بیناسن. برسیەتی تەنگی بەبابەك هەڵچنی بوو. لەرێگەدا جووتیارێکی بینی، بەکۆیلەکەی خۆی وت چەند درهەمێك

هەڵگرێت و ئەگەر ئەو پیاوە نانی پێ بوو، لێی بکرێت. ئەو پیاوە شەریکی بوو. کۆیلەی بابەك هات تا خواردنی لێ بکرێت. هاوڕێی پیاوەکە گەڕایەوە و کۆیلەکی بینی و گومانی کرد بەزۆر ئەو شتانەی هەڵگرتووە و بەمشێوەیە یەکێك لەپاسگەکانی ئاگادار کردەوە کەپیاوێکی لەو شێوە هاتووە و بەزۆر نانی لەشەریکەکەی من کڕیوە. فەرماندەی پاسگە سوار لەسەر ئەسپ شوێنی کەوت. ئەو بەشە لەکوێستانی ئەرمەنستان سەرزەمینی سەهل کوڕی سەنبات بوو. فەرماندە سەهلی ئاگادار کردەوە. ئەویش دەستەبەجێ لەگەڵ دەستەیەك لەسەربازەکانی خۆی خۆی گەیاندە پیاوەکە و کۆیلەی بابەك کەهێشتا سەرقاڵی گفتوگۆ بوون. کوڕی سەنبات پرسیاری شوێنی بابەکی لێکرد و کۆیلە شوێنەکەی بابەکی ئاشکرا کرد و کوڕی سەنباتی بردە لای بابەك. کاتێك کوڕی سەنبات بابەکی بینی، ناسییەوە، لەئەسپەکەی دابەزی و دەستی ماچ کرد و پرسی: دەخوازیت بەرەو کوێ بڕۆیت؟ بابەك وتی: بەرەو ڕۆم. کوڕی سەنبات وتی: کەسی وەك منت دەستناکەوێت ڕێگەت نیشان بدات. تۆ باش دەزانی هیچ پەیوەندییەك لەنێوان من و خەلیفەدا بوونی نییە و هەموو سوپاسالارەکانی ئەم سەرزەمینە لەبنەماڵەی تۆن و بۆ تۆ چەندین منداڵیان هێناوەتە دنیا و ئەمە لەبەر ئەوە بوو کاتێك بابەك دەیبیست یەکێك لەسوپاسالارەکان کچ یا خوشکێکی جوانی هەیە، کەسی بۆ داوای کچەکە دەنارد و ئەگەر ڕازی نەدەبوون، هێرشی دەکردنەسەر و بەزۆر ژنەکەی دەگرت و هەموو سامانی سوپاسالارەکەی دەڕفاند و بۆ شارەکەی دەگەڕایەوە.

کوڕی سەنبات فریویدا و ئەوی بردە قەڵاکەی خۆی. بابەك عەبدوڵڵەی برای بۆ قەڵای ئیستفانوس نارد. کوڕی سەنبات کەسی بەدوای ئەفشیندا نارد وئاگاداری کردەوە. ئەفشین نامەی بۆ کوڕی سەنبات نووسی و بەڵێنی پێدا باوکی سەعید و بورمارە بۆ لای ئەو ڕەوانە دەکات. کوڕی سەنبات ئەم دوانەی لەشوێنێکی تایبەت نیشتەجێ کرد و پێی وتن: لێرە ناڕۆن تا نێردراوی من بێتە لای ئێوە و ئەو کارە ئەنجام دەدەن کەپێتان دەڵێت.

کوڕی سەنبات بەبابەکی وت: لەمانەوە لەم قەڵایە بێزار بوویت، با بڕۆینە ڕاو. بابەك ئەو کارەی کرد. کوڕی سەنبات کەسی بۆ لای باوکی سەعید و بورمارە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان لەگەڵ ئەوان بن یەکیان لەم سەری دۆڵ و ئەوی دیکەیان لەو سەری دۆڵ. ئەو دوانە بەرێکەوتن. کوڕی سەنبات حەزی نەدەکرد خۆی بابەك

تەسلیمی ئەوان بکات.

کاتێك کوڕی سەنبات و بابەك سەرقاڵی ڕاو بوون، لەناکاو باوکی سەعید و بورمارە لەناو سەربازەکان دەرکەوتن. بابەك زرێیەکی سپی پۆشیبوو. ئەوانیان گرت و فەرمانیاندا بابەك لەئەسپەکەی بێتەخوار. بابەك پرسی: ئێوە کێن. یەکێك لەوان وتی: من باوکی سەعیدم و ئەو فلأنکەس. بابەك لەئەسپەکەی دابەزی و کوڕی سەنباتی جوێن باران و سەرکۆنە کرد و وتی: لەبەرابەر برێك پارەی کەم بەها منت بەم یەهودانە فرۆشت، ئەگەر پارەت دەویست، داوات لەخۆم دەکرد. باوکی سەعید ئەوی سوار ئەسپ کرد و بەرەو لای ئەفشین بەرێکەوت. کاتێك لەئوردوگا نزیك کەوتنەوە، ئەفشین هات و سەیری بابەکی کرد. ئوردووەکەی خۆی لەدوو ریزدا ڕازاندەوە و فەرمانیدا لەئەسپەکە دایبەزێنن. بابەك پیادە لەناو ئەو دوو ریزە گوزەری کرد. ئەفشین ئەوی لەژورێکدا زیندانی کرد و پاسەوانی بۆ دانا. سەهل کوڕی سەنبات، معاویەی کوڕی لەگەڵ بابەك بۆ بارەگای ئەفشین ناردبوو. ئەفشین سەد هەزار درهەمی بەو بەخشی و بۆ سەهل سەد هەزار درهەمی ڕەوانە کرد لەگەڵ پشتێنێکی زێڕین و تاجی سوپاسالاری.

ئەفشین نامەی بۆ عیسا کوڕی یونس کوڕی ئیستفانوس نووسی و داوای عەبدوڵڵەی برای بابەکی کرد کەپەنای بۆ بردبوو. عەبدوڵڵەی بۆ بارەگای ئەفشین ڕەوانە کرد. ئەفشین ئەوی لای براکەی زیندانی کرد  وموعتەسەمی ئاگادار کردەوە. موعتەسەم فەرمانی ڕەوانە کردنی ئەوانی بۆ نووسی.

هاتنی بابەك دوای گرفتاری بۆ بارەگای ئەفشین لەبەرزەند لەدەی شەوال/ ٢٧ ژوئیە بوو. ئەفشین ژن و منالی زۆری کۆکردەوە کەدەڵێن بابەك ئەوانی گرفتار کردبوو. ئەم دەستە لەعەرەبەکان و کەسانیتر ئازاد بوون. ئەفشین ئەوانی لەیەك جێگە کۆکردەوە و فەرمانی پێدان نامە بۆ کەسەکانی خۆیان بنوسن تا ئەوان بگەڕێننەوە. هەر کەس دەهات، ژن یا منالێکی دەناسییەوە و دەیبردەوە (بەو مەرجەی دوو شایەتی لەگەڵدا بێت). ژمارەیەکی زۆر لەلایەن کەس و کاریان گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان و ژمارەیەکیان مانەوە.

## زاڵبوونی عەبدولرەحمان لەتۆڵدۆ

پێشتر باسمان کرد خەڵکانی تۆڵدۆ دژی عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم پاشای ئاندۆلۆس، شۆڕشیان کرد و عەبدولرەحمان چەندین جار بۆ سەرکوت کردنی ئەوان سوپای رازاندەوە. لەساڵی ٨٣٥/٢٢١ زایینی دەستەیەك لەقەڵای رەباح کەسەربازەکانی عەبدولرەحمان بوون، شۆڕشیان کرد و بیریان لەگرتنی شاری تۆڵدۆ کردەوە،. ئەوان بارودۆخیان لەسەر دانیشتوانی شارەکە دژوار کرد و نەیانهێشت خواردەمەنییان پێ بگات. بەمشێوە لەساڵی ٢٢٢/ ٨٣٦ زایینی ڕۆشتنە ناو شارەکە.

عەبدولرەحمان، وەلیدی برای بۆ لەناو بردنی ئەوان ڕەوانە کرد. کاتێك وەلید گەیشت بینی دانیشتوانی شارەکە شەکەت و بێزارن و چیتر ناتوانن بجەنگن. لەبەر ئەمە خۆی لەرۆژی شەممە هەشتی رەجەب/ ١٦ ژوئەن بەزۆر شارەکەی وەرگرتەوە و فەرمانیدا دووبارە کۆشکی سەردەروازە کە لەرۆژگاری حەکەم وێران کرابوو، ئاوەدان بکەنەوە. ئەو تا کۆتایی شەعبانی ساڵی ٢٧/٢٢٣ ژوئیە لەوێ مایەوە. کاروبارەکانی سەقامگیر کرد و ئارامش باڵی بەسەر شارەکەدا کێشا.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا لەلای چەپی قیبلە ئەستێرەیەك دەرکەوت و بۆ ماوەی چل شەو دەبینرا. ئەم ئەستێرە شتێکی هاوشێوەی کلك پێوە بوو. سەرەتا لەرۆژئاوا و دواتر لەرۆژهەڵاتەوە دەرکەوت. ئەم ئەستێرەیە درێژ و ترسی خستە ناو دڵی خەڵکەوە. ئەم پێشهاتە کوڕی باوکی ئوسامە یەکێك لەبڕواپێکراوەکان ئاماژەی پێداوە.

هەروەها لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی ساڵح باوکی زەکەریا و حازی کەخەڵکی دیمەشق و بەگومانێك حیمسی بوو، مردن.

لەم ساڵەدا باوکی هاشم محەممەد کوڕی عەلی کوڕی باوکی خەداشی موسڵی کە لەمەعافی کوڕی عیمران حەدیسی زۆری گێڕاوەتەوە، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و سێی کۆچی ( ٨٣٧ زایینی )

## گرفتار بوونی بابەك بەدەستی ئەفشین

لەم ساڵەدا ئەفشین هاورێ لەگەڵ بابەك و عەبدوللەی برای بابەك (کەهەردوکیان ئەسیر بوون) لەمانگی سەفەری ساڵی دووسەد و بیست و سێی کۆچی/ ٢ ژانویەی ٨٣٧ زایینی هاتنە شاری تازە دروست کراوی سامەرا. لەو ڕۆژەوەی ئەفشین لەبەرزەندەوە گەیشتە سامەرا، موعتەسەم هەموو ڕۆژێك دەستێك جل و بەرگی گرانبایی و ئەسپێکی پێشکەش دەکرد. کاتێك ئەفشین گەیشتە پردەکانی حوزەیفە، هارون واسق کوڕی موعتەسەم و بنەماڵەی موعتەسەم پێشوازییان لێکرد. ئەفشین بابەکی لەکۆشکەکەی خۆی مەتیرە دابەزاند. ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد بەشێوەیەکی نەناسراو هاتە لای بابەك، ئەوی بینی و قسەی لەگەڵ کرد و لەگەڕانەوەدا، موعتەسەمی لەچەند و چۆنی بابەك ئاگادار کردەوە. موعتەسەمیش بەشێوەیەکی نەناسراو هاتە لای بابەك.

بەیانی ئەو ڕۆژە موعتەسەم بەفەرمی دانیشت و خەڵکان لەدەروازەی گشتی تا مەتیرە بەریز وەستان. موعتەسەم دەیویست بیکاتە پەندی خەڵکان، سوار فیلیان کرد و خەڵکان تا دەروازەی گشتی بۆ بینینی ئەم فیلە سەرومليان بەرز دەکردەوە.

محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زیات وتی:

| | |
|---|---|
| قد خضب الفيل كعاداته | يحمل شيطان خراسان |
| و الفيل لا تخضب اعضاوه | الا لذی شأن من الشان |

واتاکەی: فیلیان بۆ پێشهاتەکان ڕەنگ دەکرد ودەرازاندەوە لەکاتێکدا شەیتانەکەی خوراسانی لەپشتە. ئەندامەکانی فیل ڕەنگ ناکەن مەگەر بۆ پێشهاتێکی گرنگ.

دواتر ئەویان بردە کۆشکی موعتەسەم. موعتەسەم فەرمانیدا جەلادەکەی بابەك بێنن. ئەویان هینا. موعتەسەم فەرمانی بەجەلادەکەدا دەست و قاچی بقرتێنێت. جەلاد ئەو کارەی کرد و بابەك کەوتە سەرزەوی. دواتر فەرمانیدا سەر لەجەستەی جیا بکەنەوە. جەلاد ئەو کارەی کرد و سکی هەڵدڕی. موعتەسەم سەری ئەوی بۆ

خوراسان نارد و جەستەکەی لەسامەڕا هەڵواسی. فەرمانیدا عەبدوڵڵەی برای بابەك بۆ لای ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لەبەغداد ڕەوانە بکەن تا ئەو بەڵایەی بەسەر بێت کەبەسەر بابەك هات. ئەو بەڵایان بەسەر عەبدوڵڵەدا هێنا و لەنێوان دوو پردەکە هەڵیانواسی.

دەگێڕنەوە: خەرجی رووبەروو بوونەوەی ئەفشین لەگەڵ بابەك جگە لەخواردەمەنی، ئالف و توێشو، رۆژانە دە هەزار درهەم بووە کە لەکاتی ڕۆشتن پێیان دەدرا وئەگەر لەئوردوگا دەمانەوە، پێنج هەزار درهەمیان پێ دەدرا.

یەحیا کوڕی موعان، عیسا کوڕی محەممەد کوڕی باوکی خالید، ئەحمەد کوڕی جونەید، زورەیق کوڕی عەلی کوڕی سەدەقە، محەممەد کوڕی حومەیدی توسی و ئیبراهیم کوڕی لەیس ئەو سەرکردانە بوون بەدەستی بابەك کوژران.

ژمارەی ئەسیرەکانی سوپای بابەك، سێ هەزار و سێسەد و نۆ کەس بوو. ژمارەی ژن و مناڵە موسوڵمانە ئەسیرەکان لای بابەك، حەوت هەزار و شەشسەد کەس و لەبنەماڵەی بابەك، حەڤدە پیاو و بیست و سێ ژن و کچ ئەسیری ئەفشین بوون.

کاتێك ئەفشین گەیشت، موعتەسەم پێشوازی لێکرد و دوو پشتێنی زێڕینی لەپشت بەست و بیست هەزار درهەمی پێبەخشی. دە هەزار درهەمی دیکەی پێدا تا لەناو سوپاکەی دابەشی بکات. ئەوی وەك فەرمانڕەوایی سند دەستنیشان کرد و فەرمانی بەشاعیرەکاندا وەسفی بکەن.

## هێرشی رۆمییەکان بۆ سەر زێبترە

لەم ساڵەدا تۆفیل کوڕی میخائیل، پاشای رۆم هێرشی کردە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان و لەگەڵ خەڵکانی زێبترە وکەسانی دیکە، جەنگی دەستپێکرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك ئەفشین بارودۆخی لەبابەك دژوار کرد و لەتێکشکاندنی بابەك نزیك بوویەوە، بابەك نامەیەکی بۆ پاشای رۆم نووسی و ئاگاداری کردەوە کەموعتەسەم هەموو سەرباز و سوپاییەکانی خۆی تەنانەت جەعفەری خەیات (جەعفەر کوڕی دیناری خەیات کەسەرکردەی سوپاییەکان بوو) و

چێشت لێنەرەکەی (ئیتاخ کەئەویش یەکێك لەسەرکردەکانی موعتەسەم بوو) بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کردووە و کەسی لای خۆی نەهێشتۆتەوە، ئەگەر هەنووکە مەبەستی هێرش کردنە سەر موعتەسەمت هەیە، ئەو کارە بکە چوونکە کەس لەبەرابەر تۆ بەرگری و خۆڕاگری ناکات.

بابەك لەم نامەی بۆ پاشای ڕۆم هیوادار بوو ئەگەر پاشای ڕۆم سوپاکەی ڕەوانە بکات، موعتەسەم بەشێك لەسوپاکەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای ڕۆم دەنێرێت و سەرقاڵی جەنگی ئەوان دەبێت و بەمشێوەیە قورسایی جەنگ لەسەر شانی بابەك سووك دەبێت.

تۆفیل لەگەڵ سەد هەزار سەرباز یا زیاتر بەڕێکەوت، حەفتا و چەند هەزار کەسیان سەرباز و کەسانی دیکە کۆیلە و کرێکار بوون.

دەستەیەك لەسورپۆشەکان( هەڵگری دروشمی سور دژی دروشمی عەباسییەکان) کە لەکوێستانەکانی ئێران هەڵاتبوون و پەنایان بۆ ڕۆم بردبوو، هاورێیەتی ئەو سوپایان دەکرد. ئەوان شکستیان بەئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەب هێنابوو.

تۆفیەل گەیشتە زیبترە و خەڵکانی ئەو ناوچەی کوشتار و ژن و منداڵەکانی ئەسیر و سامانی خەڵکانی مەڵیتە و قەڵاکانی دیکەی موسوڵمانانی تالان و ژنەکانی ئەوانی گرت. ئەو ئەسیرە موسوڵمانەکانی لەت لەت دەکرد و چاوەکانی دەردەهێنا و گوێ و لووتی ئەوانی دەبڕی. پاسەوانانی سنور و خەڵکانی شام و جەزیرە بەرگرییان کرد و هەموویان ڕۆشتن مەگەر ئەو کەسانەی چوارپێ یا کەل و پەلی جەنگیان نەبوو.

گرتنی عەموریە

کاتێك پاشای ڕۆم هێرشی برد و ئەو بەڵای بەسەر سەرزەمینە ئیسلامییەکاندا هێنا، موعتەسەم ئاگادار بوویەوە و ئەم کارەی بەدژوار لەقەڵەمدا.

دەڵێن: بیستی ژنێکی هاشمی کەئەسیری ڕۆمییەکان بووە، هاواری کردووە: ئەی داد و بێداد موعتەسەم، موعتەسەم لەسەر تەخت دانیشتبوو، هەستا و هاواری کرد: لبیك لبیك و هەمان کاژێر هەستا و لەکۆشکەکەی خۆی قیژاندی: خێراکەن،

پەلەبکەن. سوار ئەسپەکەی بوو و ئامرازەکانی سوارکارێك وەك بزماری تەویلە و توبەرە و ئالیکی هەڵگرت، توێشوی خستە سەر پشتی ئەسپەکەی و ئامادە بوو بەلاّم بیّ ئامادە کردنی سوپا نەیتوانی پێشڕەوی بکات. ئەو لەشوێنی گشتی دانیشت و عەبدولرەحمان کوڕی ئیسحاقی قازی بەغدادی بانگ کرد و شوعبە کوڕی سەهل( یەکێك لەفەقیهەکان)ی بردە بارەگاکەی و سێسەد وبیست و هەشت دادپەروەری لەدەوری ئەم دوو کەسە کۆکردەوە و وەك شایەتی مڵکەکانی خۆی دیاریکردن، یەك لەسەر سێی بەمناڵەکان، یەك لەسەر سێی لەرێگەی خوا و یەك لەسەر سێی بەموالییەکان بەخشی.

دواتر بەرێکەوت و لەدووەمی جومادی الاوەل، یەکی ئاوریل دوو شەو لەرۆژهەلاّتی دیجلە ئوردووی لێدا و عوجەیف کوڕی عەنبەسە و عومەری فەرغانی و محەممەدی کورتە بالاّی و دەستەیەك لەخەڵکەکەی بۆ هاوکاری خەڵکانی زێبترە ڕەوانە کرد. کاتێك ئەوان گەیشتن بینیان پاشای رۆم دوای ئەوەی ئەو سەرزەمینەی وێران کردووە، بەجێی هێشتووە و گەڕاوەتە بۆ سەرزەمینەکەی خۆی. ئەوان مانەوە تا خەڵکان گەڕانەوە بۆ گوندەکانی خۆیان و دڵیان ئاسوودە بوو.

کاتێك موعتەسەم بەسەر بابەکدا سەرکەوت، لێی پرسی: کام شارەی رۆم بەهێزتر و گرتنی دژوارترە. پێی وترا: عەمورییە کە لەسەرەتای ئیسلامەوە تا ئێستا هیچ کام لەپاشا و خەلیفەکانی ئیسلام نەیتوانیوە دەستی بەسەردا بگرێت چوونکە هاوشێوەی چاوی مەسیحییەکانە و زیاتر لەکۆنستانتین ئۆپۆڵ گرنگی پیّ دەدەن.

موعتەسەم لەسامەراوە لەشکری بەرێخست. دەستەیەك ساڵی ڕۆشتنی ئەو بە٢٢٢ کۆچی/ ٨٣٧ زایینی و دەستەیەك بەساڵی ٢٢٤ کۆچی/ ٨٣٩ زایینی دەزانن. ئەو لەم لەشکرکێشییە بەرادەیەك کەل و پەلی جەنگ و توێشو و ئامرازی و حەوزی چەرمین و ئاوکێش و شتی دیکەی کۆکردەوە کەپێشتر هیچ خەلیفەیەك ئەو کارەی نەکردبوو. موعتەسەم ئەشناسی وەك فەرماندەی پێشەنگەکانی سوپاکەی و محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەبی وەك هاوکاری ئەو هەڵبژارد، فەرماندەیی باڵی راستی بەئیتاخ و فەرماندەیی باڵی چەپی بەجەعفەر کوڕی دینار کوڕی

عەبدوڵڵەی خەیات سپارد. عوجەیف کوڕی عەنبەسەی وەك فەرماندەی دڵی سوپاکەی دەستنیشان کرد. کاتێك ڕۆشتە سەرزەمینی ڕۆم، لەکەنار ڕووباری سن ئوردووی لێدا. ئەم ڕووبارە لەکەناری سەلوقیە لەنزیك دەریا و لەنێوان ئەو و تەرسوس تەنیا یەك ڕۆژ ڕێگە بوو. لەم شوێنەدا ئەسیرەکان ئاڵ و گۆڕ دەکران.

موعتەسەم ئەفشینی بۆ سەروج نارد و فەرمانی پێدا لەدەرب ئەلحەدەسەوە پێشڕەوی بکات و ڕۆژێکی بۆ هێرشی ئەو دیاریکرد کەڕۆژی کۆبوونەوەی خەڵکانی شار بوو. ئەشناسی لەڕێگەی تەرسوسەوە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەسەفساف چاوەڕوان بێت. ڕۆشتنی ئەشناس لەبیست و دووی ڕەجەب/ ١٩ ژوئەنی ڕوویدا. موعتەسەم، وەسیفی بەدوای ئەشناسدا نارد و خۆی لەبیست و چواری ڕەجەب/٢١ ژوئەن بەڕێکەوت.

کاتێك ئەشناس گەیشتە مەرج ئەسقوف (سنور)، موعتەسەم لەمەتاتیرەوە نامەیەکی بۆ نووسی کەپاشای ڕۆم لێی نزیکە و مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەوانی هەیە. ئەو لەم نامە فەرمانی بەئەشناسدا لەوێ بمێنێتەوە تا خۆی پەیوەستی دەبێت. ئەشناس سێ ڕۆژ لەو شوێنە مایەوە. لەم کاتەدا موعتەسەم نامەیەکی دیکەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا دەستەیەکی پێشەنگ ڕەوانە بکات تا چەند کەسێك لەڕۆمییەکان ئەسیر بکەن و لەکاروباری پاشای ڕۆم زانیاری بەدەست بێنن. ئەشناس، عومەری فەرغانی لەگەڵ دووسەد سوارکار نارد. کاتێك عومەر گەیشتە ئەنقەرە و سوارەکانی بۆ گرتنی پیاوێکی ڕۆمی بڵاوە پێکرد، ئەوان دەستەیەکیان لەگەڵ خۆیان هێنا کەدەستەیەکیان لەسوپاییەکانی پاشای ڕۆم بوون وکەسانی تر لەخەڵکانی ئاسایی. ئەوانیان بردە لای ئەشناس. ئەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردن و ئەوان ئاگاداریان کردەوە کەپاشا زیاتر لەسی ڕۆژە چاوەڕوانی پێشەنگەکانی سوپای موعتەسەمە بۆ ئەوەی ڕووبەڕوویان ببێتەوە. لەناکاو پاشا ئاگادار بوویەوە کەسوپایەکی گەورە لەکەنارەکانی ئەرمیناق هێرشی کردۆتە سەر سەرزەمینەکەی (یانی سوپاکەی ئەفشین). کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت، خاڵۆزاکەی خۆی وەك فەرماندەی سوپا دیاریکرد و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەفشین ڕەوانەی کرد. ئەشناس ئەو دەستەی بۆ لای موعتەسەم نارد تا لەهەواڵەکان

ئاگاداری بکەنەوە. موعتەسەم نامەیەکی بۆ ئەفشین نووسی و ئاگاداری کردەوە کەپاشای رۆم بۆ هێرش کردنە سەر ئەو بەرێکەوتووە. موعتەسەم فەرمانی پێدا لەشوێنەکەی بمێنێتەوە چوونکە لەهێرشی رۆمییەکان دەترسا. فەرمانی بەئەفشیندا تا گەیشتنی فەرمان و نامە چاوەڕوان بێت. موعتەسەم بۆ ئەو کەسەی بتوانێت نامەکە بەدەستی ئەفشین بگەیێنێت، دەهەزار درهەمی دیاریکرد.

پەیکەکان بۆ گەیاندنی نامەکە بەئەفشین بەرێکەوتن بەڵام ئەفشینیان نەدۆزییەوە چوونکە ئەو ڕۆشتبووە ناو سەرزەمینی رۆم. موعتەسەم فەرمانێکی بۆ ئەشناس نووسی و فەرمانی پێشڕەوی پێدا. ئەو پێشڕەوی کرد و موعتەسەم بەدوای ئەو. کاتێك ئەشناس لەشوێنەکەی خۆی جووڵا، موعتەسەم جێگەی گرتەوە تا ئەو جێگەی تەنیا لەئەنقەرەوە سێ مەنزڵ دوور بوو. سوپاکەی موعتەسەم رووبەرووی کەم بوونەوەی ئاڵف و ئاو بوویەوە. ئەشناس لەرێگە چەندین کەسی ئەسیر کردبوو. ئەو هەموویانی کوشت و تەنیا پیرەپیاوێك لەوان مایەوە. پیرەپیاو وتی: چ سوودێك لەکوشتنی من دەبەیت لەکاتێکدا تۆ و سوپاکەت گرفتاری کەمی ئاو و ئالیکن؟ لێرە خەڵکانی ئەنقەرە لەترسی ئێوە هەڵاتوون، ئەوان لەنزیکی ئێمەن و ئاڵف و خواردنی پێویستیان پێیە. دەستەیەك لەگەڵ من بنێرە تا ئەوان بەتۆ بسپێرم و لەبەرابەردا رێگەی من بکەرەوە. ئەشناس پێنسەد سواری لەگەڵدا نارد. ئەشناس پیرەپیاوی بەمالك کوڕی کیدەر سپارد و پێی وت: ئەگەر ئەم پیرەپیاو خواردەمەنی پێویستی خستە بەردەستت، ئازادی بکە.

پیرەپیاو ئەوانی بردە دۆڵێکی سەرسەوز، چوارپێکانیان لەوەڕان و خۆیشیان خواردیانەوە و خواردیان. درێژەیان بەرێگەدا و لەو شوێنە سەرسەوزە ڕۆشتنەدەر. پیرەپیاو ئەوانی بردە کوێستانێك و شەو لەوێ مانەوە. کاتێك شەویان کردە رۆژ، پیرەپیاو وتی: دوان بنێرن تا لەم کێوە بڕۆنەسەر. هەرکەسیان بینی، ئەسیری بکەن. چوارکەس سەرکەوتن و پیاو و ژنێکیان بینی. پیرەپیاو لێی پرسین: خەڵکانی ئەنقەرە لەکوێ خۆیان حەشارداوە. ئەوان شوێنەکەیان وت. پیرەپیاو سەربازەکانی برد تا ئەوەی توانییان لەسەرەوە خەڵکانی ئەنقەرە ببینن. ئەوان لەتەنیشت سوێرەلانێك بوون و کاتێك سەربازەکانیان بینی کەهێرش دەکەنە

سەریان، ژنان و منداڵەکانیان لەناو سوێرەلاَنەکەدا بەجێهێشت و لەگەڵ جەنگاوەرانی خۆیان رووبەرووی موسوڵمانان بوونەوە. موسوڵمانان تالاَنی زۆریان دەستکەوت وچەندین کەسیان ئەسیر کرد. کەسانێك لەناویاندا دەبینرا کەشوێنەواری برینێکی کۆنەیان پێوە دیار بوو. پرسیاری ئەم برینەیان کرد و لەوەلاَمدا وتیان: ئێمە لەجەنگی پاشا لەگەڵ ئەفشین بەشدار بووین. کاتێك پاشا لەئوردوودا بوو، ئاگادار بویەوە کەئەفشین لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەکەنارەکانی ئەرمیناق مەبەستی هێرش کردنە سەر ئێمەی هەیە. پاشا یەکێك لەخزمەکانی خۆی بەجێهێشت و خۆی هێرشی کردە سەر ئەفشین. ئێمە لەکاتی نوێژی بەرەبەیان هێرشمان کردە سەریان و شکستماندان و خوێنی پیادەکانمان ڕشت. سوپاکەی ئێمە شوێن هەلاَتووان کەوتن. کاتێك نیمەڕۆ، سوارەکانی دوژمن گەڕانەوە و بەشێوەیەکی قورس دژی ئێمە جەنگان و شکستیان بەئوردووەکەی ئێمە هێنا و تێکەلاَومان بوون. ئێمە نەمانزانی پاشا لەکوێیە و بەم شێوەیە شکستمان خوارد و تێکشکاو بۆ ئوردووگای جێگری پاشا گەڕاینەوە و بینیمان سوپاکەی شەهریار تێکشکاوە و خەڵکان لەدەوری جێگرەکەی بلاَوەیان لێکردووە. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە، پاشا لەگەڵ ژمارەیەکی کەم هات و سوپا تێکشکاوەکەی بینی و جێگرەکەی خۆی گرت و کوشتی. نامەی بۆ شار و قەلاَکان نووسی کەهەرکەس یەکێك لەسوپاییە هەلاَتووەکان بگرێت، قامچی بارانی بکات و بۆ ئەو شوێنەی پاشا دەستنیشانی کردووە، بیگەڕێننەوە بۆ ئەوەی هەموان لەدەوری کۆببنەوە و بۆ شەڕی موسوڵمانان بڕوات. پاشا کەسێکی بۆ ئەنقەرە نارد تا پارێزگاری لەخەڵکەکەی بکات، کاتێك گەیشتە ئەنقەرە، بینی خەڵکان لەشار ڕۆشتوونەتەدەر و ئەنقەرە کەسی تیا نەماوە. پاشا فەرمانی پێدا بەرەو عەمورییە بڕوات.

مالك کوڕی کیدەر لەگەڵ تالاَنی و ئەسیرەکانی خۆی ڕێگەی ئوردووگای ئەشناسی گرتەبەر. لەسەر ڕێگەکەی ژمارەیەکی زۆر مەڕ و مالاَتی کۆکردەوە و پیرەپیاوەکەی ئازاد کرد. کاتێك مالك کوڕی کیدەر گەیشتە ئوردووی ئەشناس، ئەوی لەوەی بیستبووی، ئاگادار کردەوە و ئەویش موعتەسەمی ئاگادار کردەوە. موعتەسەم شادمان بوو.

دوای سێ ڕۆژ مژدەدەری ئەفشین هات و هەواڵی تەندروستی ئەفشینی هێنا. ڕووداوەکەی ئەفشین لەبیست و پێنجی شەعبانی ئەم ساڵە/ ٢٢ ژوئیە بوو.

موعتەسەم سوپاکەی بۆ سێ بەش دابەش کرد: سوپایەك کەئەشناس لەباڵی چەپدا و موعتەسەم لەناوەڕاست و ئەفشین فەرماندەیی باڵی ڕاستی دەکرد. هەر لەشکرێك دوو فەرسەخ لەلەشکرەکەی تر دوور بوو. موعتەسەم فەرمانیدا هەر لەشکرێك باڵێکی چەپ و ڕاستی هەبێت و فەرمانیدا گوندەکانی سەر ڕێگە بسوتێنن و هەرکەسیان بینی، گرفتاری بکەن و هیچ ئاوەدانییەك نەمێنێتەوە مەگەر ئەوەی خاپوری بکەن. هەردەستەیەك لەهەر سوپایەك کە بەمەبەستی تالاّن کردن و وێرانی دەڕوات، دوای ئەنجامدانی ئەرکەکانی بۆ ناو سوپاکەی خۆی بگەڕێتەوە. لەئەنقەرەوە تا عەموریە کەحەوت مەنزڵ ڕێگە بوو، درێژەیان بەم کارەدا و سەرئەنجام سوپاییەکان گەیشتنە عەموریە.

یەکەم کەس ڕۆشتە ناو شارەکە، ئەشناس و بەدوای ئەو موعتەسەم و بەدوای ئەو ئەفشین ڕۆشتە ناو شارەکە. موعتەسەم فەرمانیدا دەوری شارەکە بگرن و هەر کام لەسەردارەکانی بۆ بەشێك لەدیواری شارەکە ڕاسپارد کەدەبوا دەستی بەسەردا بگرن و هەرکام لەسەردارەکان بە لەبەرچاو گرتنی سەربازەکانی خۆیان بورجێکیان هەڵبژارد.

یەکێك لەموسوڵمانان کەخەڵکانی عەموریە ئەسیریان کردبوو و دواتر باوەڕی بەئاییني مەسیحی هێنابوو و ژنێکی وەك هاوسەر لەناو ئەوان هەڵبژاردبوو و لەو شارەدا دەژیا، کاتێك بینی موسوڵمانان گەمارۆیان خستۆتە سەر شارەکە، لەشارەکە هەلاّت و خۆی بەبارەگای موعتەسەم گەیاند و پێی وت: لەشوێنێکی شار کەبارانی زۆری لێ باریوە و ئاو هێرشی کردۆتەسەر و دیوارەکەی داڕماوە، هێرش بکاتە سەر شارەکە. پاشای ڕۆم نامەی بۆ کارگوزاری عەموریە نووسی تا ئەو شوێنە نۆژەن بکاتەوە بەلاّم ئەو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە کەمتەرخەمی کرد تا ئەو کاتەی پاشا شارەکەی بەمەبەستێك بەجێهێشت. کارگوزار ترسا پاشا لەو شوێنەوە بڕوات وئەو وێرانییە ببینێت، لەبەر ئەمە پیشەگەرانی نارد و نومای دیوارەکەی بەسەد دروست کرد و پشتەکەی لەرووی شارەوە بەتاڵ بوو. دواتر چەندین ژووری

وەك جاران لێ دروست کرد. ئەو کەسە موعتەسەمی لەو شوێنە ئاگادار کردەوە. موعتەسەم فەرمانیدا خێوەتەکەی لەنزیك ئەو شوێنە هەڵبدرێت و کەشکەنجیرەکانی بۆ دیوارەکە دانا و دیوارەکەی بەکەشکەنجیر بەردباران کرد. دیوارەکە کەلێنی تێکەوت. کاتێك ڕۆمییەکان کەلێنەکەیان بینی، بەناچاری بەدار و تەختە پڕیان کردەوە و دار ئەستوورەکەیان پێکەوە بەست بەڵام کەشکەنجیرەکان دارەکانی لەت و پەت دەکرد. بەناچاری کۆپانەکانیان کردە ناو کەلێنەکە بەڵام نەیتوانی بەرگەی زەختی کەشکەنجیرەکان بگرێت و دیوارەکە داڕما. کۆیلەیەکی خەساو لەگەڵ کارگوزاری شارەکە نامەیان بۆ پاشای ڕۆم نووسی. ئەم کارگوزارە بەناتس ناو دەبرا. ئەو نامەکەی بەدوو پەیکدا ڕەوانە کرد کەهەردوکیان بەدەستی موسوڵمانەکان ئەسیر کران. پەیکەکانیان بردە لای موعتەسەم و ئەو نامەکانی دۆزییەوە. لەو نامەدا نووسرا بوو سوپای دوژمن دەوری شارەکەی گرتووە و ناتس دەیەوێت لەگەڵ دەستەیەك لەکەسە تایبەتەکانی خۆی بەشێوەیەکی لەناکاو و شەوانە هێرش بکاتە سەریان تا بتوانێت خۆی بەپاشا بگەیێنێت و لەدەستی دوژمن رزگاری بێت. کاتێك موعتەسەم نامەکەی خوێندەوە، فەرمانیدا بەهەرکام لەپەیکەکان هەنبانەیەکیاندا کەدە هەزار درهەمی تیا بوو، بەشێوەی پێویست پاداشتیان پێ بەخشین و باوەڕیان بەئیسلام هێنا. موعتەسەم فەرمانیدا ئەو دوانە بەدەروی عەموریەدا بسورێنن و وتیان لەبەرابەر ئەو بورجەی ناتس لەوێ جێگیرە، درەنگ بکەن تا گومان نەکەن ئەوان بەخواستی خۆیان تەسلیمی دوژمن بوون و خەڵات و دیارییان وەرگرتووە. ئەوان بەو جل و بەرگانەی موعتەسەم پێی بەخشیبوون، وەستان. ناتس و ڕۆمییەکانی هاورێی دوو نێردراوەکەی خۆیان ناسییەوە و سەرکۆنەیان کرد.

موعتەسەم فەرمانی ئامادەبوونی بەپاسەوانەکاندا و سەربازەکان بەوردی چاودێری بارودۆخیان دەکرد (لەترسی ئەوەی نەکا دوژمن بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکات) تا دیواری نێوان دوو بورجەکە وێران بوو. موعتەسەم فەرمانیدا خەندەکی عەموریە بەپێستی مەڕی لێوانلێو لەخۆڵ پڕ بکەنەوە تا ڕێگەی پەڕینەوەی سوپاییەکان ئاسان ببێت. ئەو کارەیان کرد. ئەوان عارەبانەی گەورەیان

دروست کرد کەهەر عارەبانەیەك دەکەسی هەڵدەگرت بەڵام مەبەستەکەی ئەوانی نەهێنایەدەی و بەناچاری پشتیان بەپەیژە و کەشکەنجیرەکان بەست.

بۆ بەیانی موعتەسەم لەسەر ئەو کەلێنە جەنگی دەستپێکرد. یەکەم کەس جەنگی هەڵگیرساند، ئەشناس و هاوەڵانی بوون. گۆڕەپان بچوك بوو و نەیاندەتوانی وەك پێویست بجەنگن. موعتەسەم فەرمانیدا کەشکەنجیرە گەورەکان کە بەدەوری دیوارەکەدا بڵاویان کردبوون، کۆبکەنەوە و لەنزیك ئەو کەلێنە جێگیری کردن و فەرمانیدا ئەو بەشەی دیوار، بەردباران بکەن. جەنگی رۆژی دووەم لەئەستۆی ئەفشین وسەربازەکانی بوو. جەنگان و پێشڕەوییان کرد. موعتەسەم سوار لەسەر ئەسپەکەی لەبەرابەر کەلێنەکە وەستابوو. ئەشناس و ئەفشین و سەردارە تایبەتەکان هاورێیەتیان دەکرد. موعتەسەم وتی: جەنگی ئەمرۆ پەسەند بوو. عومەری فەرغانی وتی: جەنگی ئەمرۆ لەدوێنێ باشتر بوو. (فەرغانی خۆی یەکێك لەسەردارەکانی ئەشناس بوو) کاتێك ئەشناس ئەو قسەی بیست (چاوەڕوان نەبوو فەرغانی ئەو قسە بکات) توڕە بوو بەڵام هیچی نەوت.

بۆ نیمەڕۆ، موعتەسەم و سەربازەکان گەڕانەوە و ئەشناس لەدەرگای خێوەتەکەی نزیك کەوتەوە. سەردارەکان بۆ رێز گرتن لەو لەئەسپەکانیان دابەزین. فەرغانی و ئەحمەد کوڕی خەلیل کوڕی هوشام لەناو ئەواندا دەبینران. ئەشناس پێی وتن: ئەی روو سپی زادەکان، بۆ لەگەڵ من هەنگاو هەڵدەگرن، دەبوا دوێنێ بجەنگن تا ئەو کاتەی لای سەروەری باوەڕداران کۆدەبنەوە هاوشێوەی ئەمرۆ نەڵێن جەنگی ئەمرۆ لەدوێنێ باشتر بوو. دەڵێی دوێنی کەسانی دیکە لەجیاتی ئێوە دەجەنگان، بۆ خێوەتەکانتان بگەڕێنەوە. کاتێك فەرغانی وئەحمەد کوڕی خەلیل گەڕانەوە، یەکیان بەوی دیکەی وت: بینیت ئەم روو سپی زادە چی پێ وتین و ئەمرۆ چی لەگەڵ کردین، ئایا پەیوەست بوون بەرۆمییەکان لەبوون لەگەڵ ئەشناس باشتر نییە.

فەرغانی بەئەحمەدی وت: بەم زوانە خواوەند تۆ لەشەڕی ئەو ئاسوودە دەکات. ئەو ئاگاداری نهێنییەکانی عەباس کوڕی مەئمون بوو. ئەحمەد پێداگری کرد بۆ ئەوەی ئاگادار ببێتەوە؟ (مەبەست پیلانێك بوو کەعەباس کوڕی مەئمون دژی

موعتەسەمی مامی بیری لیّ دەکردەوە) فەرغانی پێشنیاری پێکرد باشترە پەیوەستی هاوەڵانی عەباس ببێت. ئەحمەد وتی: گومان ناکەم ئەم کارە سەربگرێت. فەرغانی وت: سەری گرتووە. فەرغانی ئەوی بۆ لای حارسی سەمەرقەندی ڕەوانە کرد. ئەو ڕۆشتە لای حارس. حارس عەباسی لەمەبەستەکەی ئاگادار کردەوە بەڵام عەباس پەسەندی نەدەکرد مەبەست وپیلانەکەی ئاشکرا بکات و بەمشێوە شتێکی ئەوتۆیان بۆ باس نەکرد.

بۆ ڕۆژی سێیەم، دەبوا موعتەسەم و سوپاکەی بجەنگن کەبەشی زۆری لەمەغرببییەکان (سوپایەك لەخەڵکانی ئافریقا، جەزایر، توسن و مەراکش) و تورکەکان پێك دەهاتن. فەرماندەکەیان ئیتاخ بوو. بەباشترین شێوە جەنگان و کەلێنەکە گەورەتر بوو. جەنگ درێژەی کێشا تا بریندارى ڕۆمییەکان زیادی کرد.

سوپاسالارەکانی ڕۆم (بەتریقەکان) هەرکام پارێزگارییان لەبورج و بەشێکی دیوارەکە دەکرد. فەرماندەی بورجە تێکشکاوەکە، ناوی وندا بوو کە بەمانای گای نێر دێت. ئەو لەم ڕۆژە و ڕۆژەکانی پێشوو بوێرانە جەنگی بەڵام ناتس و کەسانی دیکە هاوکارییان نەکرد. کاتێك شەو داهات، وندا هاتە ناو ڕۆمییەکان و وتی: دەڵێی قورسای شەڕ تەنیا لەسەر شانی من و هاوەڵانی منە، هەموو سەربازەکانم بریندار بوون، یا ژمارەیەکی کەمی تیرهاوێژەکان بخەنە ژێر فەرمانی من یا شارەکەمان لەدەست دەچێت. بەڵام بەهیچ شێوەیەك هاوکارییان نەکرد و وتیان: نەئێمە هاوکاری تۆ دەکەین نەتۆ هاوکاری ئێمە بکە. وندا و هاوەڵانی بڕیاریاندا پەیوەستی سوپاکەی موعتەسەم بن و بۆ خۆیان و بنەماڵەکانیان ئەمان وەربگرن و بورج و دیوارەکەی تەسلیم بکەن.

لەبەرەبەیاندا، وندا، هاوەڵانی خۆی لەنێوان کەلێنەکە جێگیر کرد و پێی وتن: جەنگ مەکەن چوونکە دەمەوێت بڕۆمە لای موعتەسەم. ئەو ڕۆشتە لای موعتەسەم. لەو کاتەدا سوپاکەی موعتەسەم لەکەلێنی دیوارەکە نزیك ببوویەوە بەڵام بینیان ڕۆمییەکان دەستیان لەجەنگ هەڵگرتووە و چاوەڕوانن. کاتێك سوپاکەی موعتەسەم گەیشتنە کەلێن و نزیك بورجەکە، ڕۆمییەکان وتیان: مەترسن چوونکە فەرماندەکەمان لای موعتەسەمە.

موعتەسەم، وندای سوار ئەسپەکەی کرد و خۆی لەپێشەوەی سوپاییەکان هاتنە ناو کەلێنی دیوارەکە. عەبدولوەهاب کوڕی عەلی کەلای موعتەسەم بوو، ئیشارەی لەموسوڵمانەکان کرد تا لەکەلێنەکەوە بڕۆنە ناو شارەکە. سەربازەکان لەکەلێنەکەوە ڕۆشتنە ناو شارەکە. لەناکاو وندا دەستی بەریشی خۆیدا هێنا و پەشیمان بوویەوە. موعتەسەم پێی وت: بۆ پەرێشانیت؟ وندا وتی: تۆ فێڵت لەئێمە کرد. هاتبووم گفتوگۆت لەگەڵ بکەم و پەیمانی ئاشتیت لەگەڵ ببەستم بەڵام فریوتداین. موعتەسەم وتی: هەرچی بخوازی ئەنجامی دەدەم و هیچ کات دژایەتی بڕیارەکەی تۆ ناکەم. وندا وتی: ئێستا کەسەربازەکانت ڕۆشتوونەتە ناو شارەکە، دەتوانم دژایەتی چی بکەم.؟

خەڵکێکی زۆر لەڕۆمییەکان پەنایان بۆ کەنیسەیەکی گەورە برد بەڵام موسوڵمانان کەنیسەکەیان سووتاند و ئەوانیان کوشتار کرد. ناتس لەبورجەکەی خۆیدا مابوویەوە و سەربازەکانی دەوریان گرتبوو. موعتەسەم سوار لەسەر ئەسپەکەی پێشڕەوی کرد و لەبەرابەر ناتس وەستا. پێیان وت: ئەی ناتس! ئەوە سەروەری باوەڕدارانە. ناتس شمشێری بەست و هاتە خوار و لەبەرابەر موعتەسەم وەستا. موعتەسەم قامچی لێدا و بۆ خێوەتەکەی گەڕایەوە و فەرمانیدا ناتس ببەنە خێوەتەکەی. ئەو بڕێکی ڕێگەی بەپێ بڕی. موعتەسەم فەرمانیدا سوار ئەسپی بکەن. شمشێری موسوڵمانان ڕۆمییەکانی دەکوشت و سەربازە موسوڵمانەکان دەستە دەستە ڕۆمییەکانیان ئەسیر دەکرد. موعتەسەم فەرمانیدا ئەسیرە خاوەن نەژادەکان جیابکەنەوە. دیلەکانیان دیکەیان برد. هەروەها فەرمانیدا تالانییەکان لەچەند شوێنێك هەرزان فرۆش بکەن. لەماوەی کەمتر لەپێنج ڕۆژ تالانییەکان فرۆشران و پاشماوەکەیان سووتاند.

بۆ کەڵك وەرگرتن لەکات هەر کالایەك تەنیا سێ جار هاواری فرۆشتنیان بۆ دەکرد و دەفرۆشرا. کۆیلەکانیان پێنج پێنج و دە دە دەفرۆشت.

بەهەرحاڵ لەیەکێك لەڕۆژەکان تالانییەکان فرۆشران. ئەمە ئەو ڕۆژە بوو عوجەیف بڕیاریدا لەگەڵ خەڵکان دژی موعتەسەم شۆڕش بکەن. خەڵکان پەلاماری تالانییەکانیاندا. موعتەسەم شمشێری دەرکێشا و پەلاماری خەڵکانیدا. خەڵکان

لەبەرابەر ئەو هەڵدەهاتن و لەتالآنییەکان چاوپۆشییان دەکرد. ئەو بۆ خێوەتەکەی گەڕایەوە و فەرمانی وێران کردن و سوتاندنی عەموریەی دەرکرد.

ئەم رووداوە لەبیست و پێنجی رەمەزان/ بیستی ئۆگۆست روویدا. موعتەسەم پەنجا و پێنج رۆژ لەرۆم مایەوە و ئەسیرەکانی لەناو سەردارەکان دابەش کرد و دواتر رێگەی تەرسوسی گرتەبەر.

## گرفتار بوونی عەباس کوڕی مەئمون

لەم ساڵەدا موعتەسەم، عەباس کوڕی مەئمونی خستە زیندانەوە و فەرمانی نفرین کردنی دەرکرد. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك موعتەسەم، عوجەیف کوڕی عەنبەسەی بەمەبەستی جەنگی پاشای رۆم لەزێبترە لەگەڵ عومەری فەرغانی و محەممەدی کورتەبالا بۆ دیاری رۆم نارد بەلأم هاوشێوەی ئەفشین دەستی عوجەیفی ئاوەلآ نەکرد. موعتەسەم کارەکانی عوجەیفی بەکەم بەها دادەنا و عوجەیف لەم کردەوەی موعتەسەم رەنجا. لەبەر ئەمە سەرکۆنەی عەباس کوڕی مەئمونی کرد چوونکە بەیعەتی لەگەڵ باوکی ئیسحاق بەست و کەمتەرخەمی لەکارەکەی خۆیدا کرد (چوونکە ئەگەر بەیعەتی نەدەکرد سوپاییەکان ئەویان وەك خەلیفە هەڵدەبژارد) عوجەیف هانیدا تا ئەوەی لەدەستیدا بوو، بەدەستی بێنێتەوە.

عەباس بەوتەکانی عوجەیف رازی بوو و پیاوێکی بەناوی حارسی سەمەرقەندی کەخۆی عوبەیداللەی وەزاح و هاوڕێ و هاودەمی عەباس و پیاوێکی فرەزان و بیرمەند بوو، وەك نێوەنجیگەر هەڵبژارد. عەباس ئەوی کردە پەیکی خۆی و نێردەی خۆی بۆ لای سەردارەکان. ئەو لەئوردووگا هاتوچۆی کرد و سەرئەنجام دەستەیەك لەسەردارەکان دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد بەهەمان شێوە دەستەیەك لەکەسە نزیکەکانی موعتەسەمیش بەیعەتیان بەست. عەباس بەو کەسانەی بەیعەتیان دەبەست، دەیوت: کاتێك سەردەمی شۆڕش گەیشت، هەردەستە لەسەرکردەکان ئالآی شۆڕش بەرز بکەنەوە و فەرماندەکەی خۆیان بگرن و ئەو کەسانەی لەکەسە نزیکەکانی موعتەسەمن، دژی ئەو راپەڕن و خوێنی برێژن. کەسە نزیکەکانی ئەفشین و ئەشناس کەبەیعەتیان لەگەڵ عەباس کردبوو، فەرمانیان پێدرا خوێنی

ئەوان بڕێژن بەهەمان شێوە فەرماندەکانی دیکەیش. ئەوان بۆ ئەم کارە بەڵێنیاندا.

کاتێك سوپا ڕێگەی ئەنقەرە و عەمووریەی گرتەبەر و ئەفشین لەکەنارەکانی مەڵتیییەوە هێرشی کرد، عوجەیف ئیشارەی لەعەباس کرد کەکاتی ئەوە هاتووە شۆڕش دەست پێبکەیت چوونکە دەستەیەکی کەم هاوڕێیەتیان دەکرد. دەیویست لەوێ خوێنی بڕێژێت و ڕێگەی بەغداد بگرێتەبەر چوونکە سەربازەکان لەگەڕانەوە بۆ بەغداد و شەڕ نەکردن شادمان دەبن. عەباس بەم کارە ڕازی نەبوو، وتی: من ئەم جەنگ و غەزایە ناشێوێنم و سەربازەکان بەرەو هەڵدێری لەناوچوون نابەم تا ئەو کاتەی دەڕۆنە ڕۆم و دەست بەسەر عەموریەدا دەگرن. بەمشێوەیە مانەوە تا شاری عەموریە دەستی بەسەردا گیرا. عوجەیف بەعەباسی وت: ئەی خەوتوو! عەموریە دەستی بەسەردا گیرا و ئەم پیاوە لەبەردەستی تۆدایە. دەستەیەك ناچار بکە تا تالآنییەکان تالآن بکەن. موعتەسەم کاتێك ئەم هەواڵە ببیستێت سوار ئەسپەکەی دەبێت ئەوسا تۆ فەرمان دەدەیت تا لەهەمان شوێن خوێنی بڕێژن. دووبارە عەباس ڕازی نەبوو، وتی: چاوەڕوان دەبم تا دەرفەتی گونجاو بەدەست بێت، ئەوسا ئەم کارە ئەگەری دەبێت.

عوجەیف فەرمانی تالآن کردنی تالآنییەکانیدا، سەربازەکان ئەو کارەیان کرد و موعتەسەم سوار لەسەر ئەسپ هات و خەڵکان ئارام بوونەوە. عەباس لەو کەسانەی بەڵێنی لێ وەرگرتبوون، کەڵکی وەرنەگرت. ئەوانیش نەیاندەویست بێ فەرمانی عەباس موعتەسەم بکوژن.

ئەم هەواڵە هەمان ڕۆژ بەفەرغانی گەیشت. فەرغانی خزمێکی لەناو دەوڵەتەکەی موعتەسەمدا هەبوو کەکوڕێکی بێ ڕیش بوو. ئەو هاتە لای کوڕەکەی فەرغانی و لەگەڵ ئەودا مەی خواردنەوەیان دەست پێکرد. ئەو لەم شەوەدا وتی: موعتەسەم سوار و ئەو لەپێشییەوە رایدەکرد و هەروەها وتی موعتەسەم فەرمانی داوە هەرکام لەتالآنچییەکانی بینی، بیانکوژێت. فەرغانی ئەم قسەی لەو کوڕە بیست و ترسا ئەو کوڕە زیانی بەرکەوێت، بۆیە وتی: کوڕم، کەمتر بڕۆ لای سەروەری باوەڕداران و لەخێوەتەکەی خۆت بمێنەرەوە و ئەگەر دەنگەدەنگ و ئاژاوەت بیست، لەشوێنەکەی خۆت مەجوڵێ چوونکە گەنجێکی کەم ئەزموونیت و لەمەبەستی سوپا

ئاگادار نیت. گەنج قسەکەی فەرغانی بیست (زانی شۆڕشێکی دیکە بەڕێوەیە)

موعتەسەم بەمەبەستی گەڕانەوە عەموریەی بەجێهێشت. ئەفشین، کوڕی ئەقتەعی لەڕێگەیەکی جیاواز لەڕێگەی موعتەسەم ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر ئەو شوێنەی بۆی دیاریکراوە و لەڕێگەدا پەیوەستی ببێت. کوڕی ئەقتەع ڕۆشت و تالان کردنی کردە پیشە و لەو شوێنەی ئەفشین دیاری کردبوو، لەگەڵ تالانییەکان پەیوەستی سوپاکە بوویەوە و ئوردووی لێدا. هەر سوپایەك بەجیا ئوردووی لێدا. عومەری فەرغانی و ئەحمەد کوڕی خەلیل لەئوردووی ئەشناس روویان کردە ئوردووەکەی ئەفشین تا لەئەسیرەکان کۆیلە بکڕن. ئەفشین ئەوانی بینی، ئەو دوانە بۆ ڕێزگرتن لەئەفشین لەئەسپەکەیان هاتنەخوار و سڵاویان بۆ نارد و بەرەو لای تالانییەکان بەڕێکەوتن. کەسەکانی ئەشناس ئەوانیان بینی و ئەشناسیان ئاگادار کردەوە. ئەشناس سیخوڕێکی راسپارد تا لەکار و مەبەستی ئەوان ئاگادار ببێتەوە. ئەو سیخوڕە ئەوانی سەرقاڵی کڕینی تالانی بینی. گەڕایەوە و ئەشناسی لێ ئاگادار کردەوە. ئەشناس فەرمانی بەپەردەدارەکەیدا پەیامیان بۆ ببات تا بۆ ئوردووگاکەی خۆیان بگەڕێنەوە چوونکە بۆ ئەوان باشترە. ئەو دوو سەرکردە لەم پەیامە ڕەنجان. بڕیاریاندا بڕۆنە لای فەرماندەی سوپا و پێی بڵێن: ئێمە بەندەی سەروەری باوەڕدارانین و بە هەرکەس جگە لەئەشناس کەدەخوازیت؛ بمانسپێرە چوونکە ئەو گرنگی بەئێمە نادات. ئەو جوێنی پێداوین و هەڕەشەمان لێدەکات دەترسین مەبەستی کوشتنی ئێمەی لەسەردا بێت.

موعتەسەمیان لەم داوایە ئاگادار کردەوە، بەڵام کاتی ڕۆشتن و ئەشناس و ئەفشین هاوڕێیەتیان دەکرد. موعتەسەم بەئەشناسی وت: عومەر و ئەحمەدی بێ ئاوز بەباشترین شێوە تەمێ بکە؛ سوار ئێستریان بکە تا دەگەینە سەفساف. لەم کاتەدا ئەو گەنجە بێ ریشە هات و ئەوەی ئەو شەوە لەفەرغانی بیستبوو، بۆ موعتەسەمی گێڕایەوە. موعتەسەم بوغای نارد و ئەو فەرغانی لای ئەشناس هێنا و سەبارەت بەقسەی گەنجەکە پرسیاری لێکرد. فەرغانی حاشای لەو قسەیە کرد و وتی ئەو گەنجە ئەو شەوە مەست بووە و لەقسەکانی من تێنەگەیشتووە. موعتەسەم

ئەوی بەئیتاخ سپارد و ڕۆشت. ئەحمەد کوڕی خەلیل بەئەشناسی وت: من نهێنییەکم بۆ سەروەری باوەڕداران هەیە و تەنیا بەخۆی دەڵێم. ئەشناس سوێندی خوارد و وتی: ئەگەر لەو نهێنییە ئاگاداری نەکاتەوە قامچی بارانی دەکات تا دەمرێت. ئەحمەد کاتێك ئەم قسەی بیست، هاتە لای ئەشناس و لەمەبەستەکەی عەباس کوڕی مەئمون و سەرکردەکان و حارسی سەمەرقەندی ئاگاداری کردەوە. ئەشناس کەسی نارد و حارسیان گرت و قۆڵبەست بۆ لای موعتەسەمیان نارد. پێشتر ئەم پێشهاتەمان گێڕاوەتەوە. کاتێك هاتە لای موعتەسەم، هەموو شتێکی بێ کەم و کوڕی بۆ باس کرد و ناوی هەموو ئەوکەسانەی برد کەبەیعەتیان لەگەڵ عەباس بەستبوو. موعتەسەم ئازادی کرد و سامانێکی زۆری پێ بەخشی بەڵام چوونکە ژمارەی سەرکردەکان زۆر و نەیدەتوانی سزای هەموویان بدات، بەوتەکانی حارس رازی نەبوو.

موعتەسەم، عەباس کوڕی مەئمونی بردە بارەگاکەی و بەرادەیەك شەرابی دەرخوارددا تا سەرخۆش و مەست کەوت و دواتر سوێندیدا هیچ شتێکی لێ نەشارێتەوە. ئەویش هەموو راستییەکانی پێ وت. لەم کاتەدا موعتەسەم گرتی و تەسلیمی ئەفشینی کرد. ئەفشین لای خۆی زیندانی کرد.

موعتەسەم سەرکردەکانی گرت و سوار ئێستری بێ کۆپانی کردن. موعتەسەم، شاه کوڕی سەهلی لەخوراسانییەکان گرت و پێی وت: ئەی رووسپی زادە، چاکەم لەگەڵ کردی بەڵام بەدوژمنی وەڵامت دامەوە. شاه کوڕی سەهل وتی: رووسپی زادە ئەوە. ئیشارەی بۆ عەباس کرد، ئەگەر ئەو دەستی منی ئاوەڵا دەکرد هەنووکە لەسەر ئەم جێگە و تەختە دانەدەنیشتیت و بەمشێوەیە قسەت نەدەکرد. موعتەسەم فەرمانیدا سەری ببڕن. ئەو یەکەم کوژراوی ئەم دەستەیە بوو. عەباسی بەئەفشین سپارد. کاتێك گەیشتنە مەنبێج، عەباس داوای خواردنی کرد، خواردنی زۆریان بۆ هێنا و تێر خواردی بەڵام ئاویان پێنەدا. دواتر لەراخەرێکیان ئاڵاند و ئەوەندەیان تلاندەوە تا مرد و یەکێك لەبراکانی نوێژی لەسەر جەستەکەی خوێند.

کاتێك موعتەسەم گەیشتە نەسیبین، چاڵێکی بۆ عومەری فەرغانی هەڵکەند و عومەری تێکرد و دواتر چاڵەکەی پڕ کردەوە.

عوجەیف لەباعیناسا لەنزیك موسڵ مرد. دەڵێن: خواردنی زۆریان پێدا بەڵام نەیانهێشت ئاو بخواتەوە و مرد.

موعتەسەم هەموو سەرکردەکانی گرت و دوای کەمتر لەچەند رۆژ هەموویان لەناوچوون. موعتەسەم تەندروست گەڕایەوە بۆ سامەرا و لەهەمان رۆژ عەباسی نفرین کراوی بە(لعین) ناوبرد. منداڵەکانی مەئمونی گرت و لەکۆشکەکەی خۆی دەستبەسەری کردن و هەموویان مردن.

لێرەدا یەکێك لەسەرەنج راکێشترین بەسەرهاتەکان ئەوەیە: محەممەد کوڕی عەلی ئیسکافی سەرپەرەستی زەوییەکانی عوجەیف بوو. بنەماڵەی عوجەیف سکاڵایان لەئیسکافی کرد (کەسامانەکانی عوجەیف دەدزێت) عوجەیف ئەوی گرت و مەبەستی کوشتنی کرد و ئەو لەترسا خۆی پیس کرد( میزی کرد بەخۆیا) دواتر دەستەیەك نێوەنجیگەرییان کرد و رزگارییان کرد بەڵام عوجەیف ئەوی خستە زیندانەوە. دوای ئەوەی موعتەسەم هێرشی کردە سەر رۆم و عوجەیفی بەو شێوەی ئاماژەمان پێدا گرت و کوشتی و ئەو کەسانەی لەزیندانی عوجەیفدا بوون، ئازاد کران. یەك لەوان ئیسکافی بوو. ئەو دواتر لەجەزیرە کارێکی دەستکەوت و پێوەی سەرقاڵ بوو. ئیسکافی دەڵێت: رۆژێك بەرەو تەپۆڵکەی باعیناسا دەڕۆشتم، پێویستم بوو بڕۆم دەست بەئاو بگەیێنم، لەتەپۆڵکەیەك نزیك کەوتمەوە و میزم کرد و هاتمەخوار. پیرەپیاوێك لەباعیناسا منی بینی و وتی: گۆڕی عوجەیف لەو تەپۆڵکەدایە و شوێنی گۆڕەکەی نیشاندام. ئەو شوێنە بوو کەمیزم پیاکرد. ئەم بەسەرهاتە دوای یەك ساڵ روویدا نەزیاتر نەکەمتر.

## مەرگی زیادە الله کوڕی ئەغلەب و سەرەتای فەرمانڕەوایەتی ئەغلەبی برای

لەچواردەی ڕەجەب/ سیانزەی جونی ئەم ساڵە زیادە الله کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە مرد. ساڵەکانی تەمەنی پەنجا و یەك ساڵ و نۆ مانگ و هەشت رۆژ درێژ بوویەوە و بیست ساڵ و حەوت مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد. دوای ئەو براکەی باوکی عەفان، ئەغلەب کوڕی ئیبراهیم جێگەی گرتەوە. ئەو

چاکەی لەگەڵ سوپاییەکان کرد و دادپەروەری کردەپیشە و رۆژانەی کرێکارانی زیاد کرد و رێگەی دەستدرێژی کردنی لێ گرتن. هێنانی مەی و شەرابی بۆ قیروان یاساغ کرد. لەساڵی ٨٣٨/٢٢٤ زایینی سوپایەکی بۆ گرتنی سیسیل ڕەوانە کرد، تالانی زۆری دەستکەوت و تەندروست گەڕایەوە.

لەساڵی ٢٢٥/ ٨٣٩ زایینی جارێکی دیکە سوپایەکی بۆ گرتنی قەڵاکانی بەلوت، ئەبلانتو، قرلون، مەرو (جیاواز لەمەروی ئێران) ڕەوانە کرد و کەشتی گەلی موسوڵمانان رێگەی شاری قەلوریەی گرتەبەر و دەستی بەسەردا گرت و رووبەرووی کەشتییەکانی پاشای قوستەنتەنییە بوویەوە و دوای جەنگ، شکشتی پێهێنان و کەشتییەکانی رۆمییەکان تێکشکاو بۆ قوستەنتەنییە گەڕانەوە.

لەساڵی ٨٤٠/٢٢٦ زایینی سوپایەك لەموسوڵمانەکان لەسیسیلەوە بەرەو قەسریانە ڕەوانە کران. ئەم سوپایە تالانی زۆری دەسکەوت و زۆربەی ناوچەکانی کردە خۆراکی ئاگر و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد بێ ئەوەی کەس بەرگری بکات. لەوێوە سوپای موسوڵمان رێگەی قەڵای غیرانی گرتەبەر. ئەم قەڵایە چل ئەشکەوتی بۆ بەرگری کردن تیا دروست کرابوو. لەم جەنگەدا دەست بەسەر ئەشکەوتەکاندا گیرا و باوکی عەفان، لەوێ مرد، ئاماژەی پێدەدەین.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا لەمانگی شەوال/ ئۆگۆست، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم (فەرماندەی ئێرانی نەژاد)بریندار کرا. یەکێك لەکۆیلەکانی بریندراری کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود ڕێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بەرەو ئەلبە و قەڵاکان ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەقەڵای غەرات دابەزین و دەوریان گرت و هەموو سامانی قەڵاکەیان تالان و خەڵکەکەیان کوشت و ژن و منداڵەکانیان ئەسیر کرد و گەڕانەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و چواری کۆچی ( ٨٣٨ زایینی )

### شۆڕشی مازیار لەتەبەرستان

لەم ساڵەدا مازیار کوڕی قارن کوڕی ونداد هورموز لەتەبەرستان ڕێگەی ناسازگاری موعتەسەمی گرتەبەر و ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و سوپاکەی موعتەسەم پرژ و بڵاو بوویەوە.

دەڵێن هۆکارەکەی ئەمە بووە: مازیار، عەبدوالله کوڕی تاهیری خۆش نەدەویست و باجی بۆ نەدەنارد. موعتەسەم فەرمانی پێدا باجی خۆی تەسلیمی عەبدوالله بکات بەڵام مازیار وەڵامی دایەوە: جگە لەتۆ باج بەکەس نادەم. موعتەسەم پەیکی دەنارد و باجی لەهاوەڵانی مازیار لەهەمەدان وەردەگرت و دەیدا بەراوێژکارەکەی عەبدوالله کوڕی تاهیر تا ڕەوانەی خوراسانی بکات.

دژایەتی نێوان مازیار و عەبدوالله قوڵ بوویەوە و عەبدوالله نامەی بۆ موعتەسەم دەنووسی تا ترسی ئەو لەمازیار زیاد بکات.

کاتێك ئەفشین سەرکەوتنی بەسەر بابەك بەدەست هێنا و پێگەی لای موعتەسەم بەرز بوویەوە، تەماحی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی لەسەردا پەروەردە کرد و نامەیەکی بۆ مازیار نووسی خۆشەویستی ئەوی بەدەست هێنا و هاوڕێیەتی خۆی نیشاندا و ئاگاداری کردەوە کەموعتەسەم مژدەی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی بەو (ئەفشین) داوە. هیوای دەبرد ئەگەر عەبدوالله ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ مازیار بگرێتەبەر، لەئەنجامدا فەرمانڕەوایەتی خوراسان بەو دەگات. لەبەر ئەمە مازیاری بۆ ناسازگاری عەبدوالله هاندا. ئەویش ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ڕێگەی تەبەرستانی بەسەر هەموان داخست. موعتەسەم نامەی بۆ عەبدوالله کوڕی تاهیر نووسی و فەرمانی جەنگی مازیاری پێدا. لەلایەکی دیکە ئەفشین نامەی بۆ مازیار نووسی و بۆ جەنگی تاهیر هەڵیخڕاند و پێی وت ئەوەی بیەوێت، لای موعتەسەم بۆی ئامادە دەکات. ئەفشین دڵنیا بوو لەوەی مازیار لەشەڕ لەگەڵ عەبدوالله سەرکەوتن بەدەست دێنێت و موعتەسەم ناچار دەبێت ئەفشین و سوپاکەی بۆ هاوکاری عەبدوالله ڕەوانە بکات.

کاتێك مازیار پەردەی لەسەر ناسازگاری خۆی هەڵگرت، پێشنیاری بەیعەتی خۆی بەخەڵکان کرد و خەڵکانیش بەنارەزامەندییەوە بەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەو لەو کەسانەی حەزیان بەبەیعەت نەدەکرد بارمتەی وەرگرت و زیندانی کردن و فەرمانیدا سامانی خاوەن زەوییەکان تالآن بکەن.

مازیاریش نامەی بۆ بابەك دەنووسی و بەرادەیەك باجی بەپەلە کۆدەکردەوە کەباجی یەك ساڵی لەماوەی دوو مانگ لەخەڵك دەستاند. ئەو فەرمانی بەیەکێك لەسەرکردەکانی خۆی بەناوی سەرخاستاندا کەهەموو دانیشتوانی ئامول و ساری بگرێت و بۆ کوێستانێك لەنێوان رێگەی ئامول و ساری ببات کە بەهورموزئاباد ناوی دەبرا. هەموویانی لەوێ زیندانی کرد. ژمارەی ئەم دانیشتوانە بیست هەزار کەس بوو. مازیار کاتێك ئەم کارەی کرد، هێزی زیادی کرد و فەرمانیدا دیواری ئامول و ساری و تەمیس وێران بکەن. فەرمانبەران ئەم دیوارانەیان وێران کرد.

سەرخاستان دیوارێکی دروست کرد لەتەمیسەوە بۆ دەریا کەدرێژییەکەی سێ مایل بوو. لەسەر بنەمای دیوارێك دروست کرا کەخوسرەوان بۆ پشتیوانی کردن لەتەبەرستان لەبەرابەر تورکەکان دروستیان کردبوو. لەپشت دیوارەکەوە خەندەکێکی قوڵی هەڵکەند. خەڵکانی گورگان نیگەران بوون و لەم کارە ترسان و دەستەیەکیان بۆ نەیشابوور هەڵاتن. عەبدوالله کوڕی تاهیر، مامی خۆی حەسەن کوڕی حسەین کوڕی موسعەبی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ پارێزگاری کردن لەگورگان راسپارد و فەرمانی پێدا لەنزیك ئەو خەندەکە دابەزێت کەسەرخاستان هەڵیکەندبوو. حەسەن ڕۆشت و لەشوێنی دیاریکراو دابەزی. دووری ئەو لەگەڵ سەرخاستان تەنیا ئەم خەندەکە بوو. کوڕی تاهیر، حەیان کوڕی جەبەلەی لەگەڵ چوار هەزار سەرباز بۆ کومش(قومس) ڕەوانە کرد. ئەو لەکەناری کوێستانی شەروین ئوردووی لێدا. موعتەسەم لەلایەن خۆیەوە محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەب برای ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و حەسەن کوڕی قارنی تەبەری و تەبەرییەکانی هاورێی ئەو و مەنسور کوڕی حەسەن پاشای دەماوەندی (بۆ جەنگی مازیار) ڕەوانەی ڕەی کرد تا لەو شارەوە رێگەی تەبەرستان بگرنەبەر و باوکی ئەلساجی بۆ لارز و دەماوەند نارد.

کاتێك سوپاییەکان، لەهەموو قۆڵەکانەوە گەمارۆیان خستە سەر مازیار، سەربازەکانی سەرخاستان لەگەڵ سەربازەکانی حەسەن کوڕی حسەین گفتوگۆیان دەکرد( ئەوەندە لەیەك نزیك ببوونەوە) بەشێك لەسوپاکەی حەسەن لەگەڵ سوپاکەی سەرخاستان یەکیان گرت و بڕیاریاندا لەخەندەکە بپەڕنەوە و ڕێگەیەك بۆ هێرش کردن بدۆزنەوە. حەسەن لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار نەبوو. لەناکاو سوپاییەکانی ئەو بینیان هاوڕێکانیان لەدیوارەکە گوزەریان کردووە. سوپاییەکان سەیری یەکیان دەکرد، کەوتنە جموجۆڵ و هێرشیان برد. حەسەن ئاگادار بوویەوە و هاواری کرد: دەست هەڵبگرن بەڵام گوێیان لێ نەگرت و ئاڵاکەی خۆیان لەئوردووگاکەی سەرخاستان هەڵکرد. سەرخاستانی ئاگادار بوویەوە، ئەو لەگەرماودا بوو و هەڵات. کاتێك حەسەن بینی سوپاییەکان لەدیوارەکە پەڕیونەتەوە، وتی: خواوەندا، ئەوان نافەرمانی فەرمانی منیان کرد بەڵام گوێڕایەڵی فەرمانی تۆ بوون، هاوکارییان بکە. هاوەڵانی حەسەن هێرشیان برد و بێ هیچ خۆڕاگرییەك ڕێگەکان و ئوردووگای سەرخاستانیان گرت و شەهریاری برایان ئەسیر کرد. لەکاتی شەو خەڵك لەکوشت وکوشتار و تاڵانی دەستیان هەڵگرت. حەسەن شەهریاری کوشت. سەرخاستان بەپێ پەتی هەڵات، تینویەتی تەنگی پێهەڵچنی، لەئەسپەکەی هاتەخوار و ئەسپەکەی بەستەوە. یەکێك لەهاوڕێکانی( کۆیلەکەی جەعفەر) ئەوی بینی. سەرخاستان وتی: ئەی جەعفەر، کەمێك ئاوم بۆ بێنە ئەوەندەی نەماوە لەتینویەتیدا بمرم. جەعفەر وتی: ئاوم پێ نییە. جەعفەر دەڵێت: لەناکاو چەند لەهاوڕێکانم هاتن، پێم وتن: ئەم شەیتانە ئێمەی بەرەو لەناوچوون برد، بۆ تەسلیمی پاشای نەکەین و ئەمان بۆ خۆمان وەربگرین. لەم کاتەدا هێرشمان کردە سەر سەرخاستان و دەست و پێمان بەستەوە. سەرخاستان پێی وتن: سەد هەزار درهەمم لێ بستێنن و ئازادم کەن، عەرەبەکان هیچ بەئێوە نادەن. وتیان: پارەکە بێنە. سەرخاستان وتی: لەگەڵم وەرنە کۆشکەکەم و پارەکە وەربگرن. سوێند دەخۆم پەیمان نەشکێنم بەڵام ئەوان رازی نەبوون و بۆ ئوردووگای موعتەسەمیان برد. لەناکاو دەستەیەك لەسوارەکانی حەسەن ڕووبەڕوویان بوونەوە. سەرخاستانیان لێ سەندن و لەو کەسانەیاندا. ئەویان بردە

لای حەسەن. حەسەن فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

سەرخاستان هاورێیەکی بوو لەخەڵکانی عێراق بەناوی باوکی شاس. ئەو هۆنراوەی دەهۆنییەوە و ڕێ ورەسمی عەرەبەکانی فێری سەرخاستان دەکرد. کاتێك عەرەبەکان دژی سەرخاستان شۆڕشیان کرد، سامانی باوکی شاسیان تالان کرد. باوکی شاس گۆزەیەك ئاوی هەڵگرت و هەڵات و هاواری دەکرد: ئاو لەرێگەی خوا، بەمشێوەیە توانی خۆی دەرباز بکات. ئەو ڕۆشتە خێوەتی دەبیرەکەی حەسەن بەڵام ئەویان ناسییەوە و بردیانە بارەگاکەی حەسەن. حەسەن ڕێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد و وتی: هۆنراوەیەك بهۆنەرەوە و وەسفی خەلیفە بکە. لەوەڵامدا وتی: سوێند بەخوا لەترسا ئایەیێکی قورئانم لەبەر نییە، چۆن دەتوانم هۆنراوەیەکی باش بێنمە سەرزمان.

حەسەن سەری سەرخاستانی بۆ لای عەبدوالله کوڕی تاهیر نارد. حەییان کوڕی جەبەله موالی عەبدوالله کوڕی تاهیر لەگەڵ حەسەن کوڕی حسەین بەرەو تەمیس هاتبوو، نامەی بۆ قارن کوڕی شەهریاری برازای مازیار نووسی و ئەوی بۆ پاشایەتی هاندا و بەڵێنیدا ئەو بکاتە فەرمانڕەوای کوێستانی باوکی و باوەگەورێیی. قارن لەسەردارەکانی مازیار بوو. مازیار ئەوی کردبووە هاورێی براکەی خۆی عەبدوالله کوڕی قارن و چەند کەس لەسەرکردە بڕواپێکراوەکانی خۆی پەیوەستی ئەوان کردبوو. کاتێك حەییان هانیدا و قارن بەڵێنیدا کەکوێستان و شاری ساریە تا کەنارەکانی گورگان بەوبسپێرێت بەو مەرجەی کاتێك ئەو پەیمانەکەی خۆی بردەسەر، ئەو بکاتە فەرمانڕەوای کوێستانی باوك و باوەگەورێی، بەمەرجەکە ڕازی بوو. حەییان بۆ عەبدوالله کوڕی تاهیری نووسی و ئەویش ڕازی بوو بەڵام فەرمانی بەحەییاندا نەڕواتە ئەو سەرزەمینە مەگەر ئەو کاتەی ئاسوودە بێت لەوەی ناکاوگیر نابێت بۆ ئەوەی باوەڕ بەوتەکانی ئەو بکات لەترسی ئەوەی نەکا قارن ڕێگەی فرت و فێڵ بگرێتەبەر.

حەییان ئەمەی بۆ قارن نووسی. قارن، مامی خۆی عەبدوالله کوڕی قارنی برای مازیار و هەموو سەردارەکانی خۆی بۆ سەر سفرەکەی بانگێشت کرد. کاتێك خواردنیان خوارد و کەرەستەکانی شەڕیان دانا، هاوەڵە چەکدارەکانی دەوریان

گرتن و ئەوانیان قۆڵبەست بۆ لای حەییان کوڕی جەبەلە نارد و لەوێ ئەسیر کران. حەییان لەگەڵ دەستەکەی خۆی ڕۆشتە کوێستانی قارن. مازیار لەم هەواڵە ئاگادار و خەمبار بوو. کوهیاری برای پێی وت: بیست هەزار لەموسوڵمانەکان لەپێلاودوور و جۆلا لای تۆ ئەسیرن و تۆ نیگەرانی ئەوانی، لەگەڵ ئەسیرەکانی خۆت چی دەکەیت؟ مازیار فەرمانیدا هەموو ئەسیرەکان ئازاد بکەن، دواتر دەستەیەك لەگەورەکانی بانگ کرد و پێی وتن: ئێوە بنەماڵەکانتان لەناو دەشتەکاندایە و لەوە دەترسم ئەسیر بکرێن. بیر لەوەرگرتنی ئەمان بۆ خۆتان بکەنەوە. ئەوان ڕۆشتن و ئەمانیان بۆ خۆیان وەرگرت.

کاتێك خەڵکانی ساری ئاگادار بوونەوە کەسەرخاستان لەناوچووە و حەییان ڕۆشتۆتە کوێستانەکانی شەروین، دژی کارگوزارەکەی مازیار شۆڕشیان کرد. کارگوزار هەڵات و خەڵك دەرگای زیندانەکانیان کردەوە و زیندانییەکان ئازاد کران. حەییان هاتە ناو شاری ساری. کوهیاری برای مازیار ئاگادار بوویەوە کەحەییان دەستی بەسەر کوێستانی شەرویندا گرتووە و گەشتۆتە ساری. ئەو محەممەد کوڕی موسا کوڕی حەفسی بۆ لای حەییان نارد تا ئەمانی بۆ وەربگرێت و ئەو مازیار بگرێت بەو مەرجەی فەرمانڕەوای سەرزەمینی باوك و باوەگەورێی بێت. ئەو لەگەڵ ئەحمەد کوڕی سەقەری ڕۆشتە لای حەییان و پەیامەکەی کوهیاریان گەیاند. حەیان ڕازی بوو.

کاتێك هەردووك گەڕانەوە، حەییان ئەحمەدی بینی کەسوار ئەسپێکی ڕەسەن بووە، کەسی نارد و ئەسپەکەی لێ سەند. ئەحمەد لەم کارە توڕە بوو، وتی: ئەم جۆلازادە بەمشێوەیە هەڵس و کەوتم لەگەڵ دەکات، دواتر نامەی بۆ کوهیار نووسی: هاوار لەتۆ، بۆ بەلارێدا دەڕۆیت، کەسێکی وەك حەسەن کوڕی حسەین مامی فەرمانڕوا عەبدوالله کوڕی تاهیر پشتگوێ دەخەیت و بەئەمانی ئەم جۆلازادە ڕازی دەبیت و براکەت بەو دەسپێری و پێگەی خۆت لەبیر دەکەیت و دەبیتە هۆی ئەوەی حەسەن بەهۆی پشتگوێ خستنی ئەو ڕقی تۆ لەدڵ بگرێت.

کوهیار لەوەلامدا نووسی: گومان دەکەم لەسەرەتاوە هەڵە بووم. بەڵێنم بەو پیاوەدا دوو بەیانی خۆم تەسلیم بکەم و ئەگەر ئێستا ڕێز لەبەڵێنەکەم نەگرم

دەترسم لەناوم ببات، دەست بەسەر سامانەکەمدا بگرێت و خوێنم برێژێت، ئەگەر ڕێگەی جەنگ بگرم، ئەوەی ڕستومانە دەبێتەوە بەخوری.

ئەحمەد نووسی: لەڕۆژی دیاریکراو یەکێك لەخزمە نزیکەکانی خۆت بنێرە تا وەك بارمتە لای ئەو بێت و نامەیەکی بۆ بنووسە کە بەشێوەیەك نەخۆش کەوتوویت کەتوانای هەستانە سەرپێت نییە و چاك بوونەوەی ئەم نەخۆشییە سێ ڕۆژ دەخایەنێت، ئەگەر باش بوویتەوە چ باشتر وگەرنە بەکەژاوە دەڕۆیتە لای، ئێمەیش ناچاری دەکەین بەم پێشنیارە رازی ببێت. کوهیار رازی بوو.

ئەحمەد کوڕی سەقەر و محەممەد کوڕی موسا کوڕی حەفس نامەیان بۆ حەسەن کوڕی حسەین لەتەمیس نووسی: بۆ لای ئێمە وەرە تا مازیار و سوارەکانی بەتۆ بسپێرین وگەرنە هەڵدێن. ئەم نامەیان بەپەیکدا ڕەوانە کرد. کاتێك نامەکە بەدەستی حسەن گەیشت، دەستەبەجێ سوار ئەسپەکەی بوو و ڕێگەی سێ ڕۆژەی لەیەك شەودا بڕی. ڕۆژی دواتر بەرەبەیان ڕووی کردە خورەم ئاباد. ئەم شوێنی دیاریکراوی کوهیار و حەییان بوو. حەیان دەنگی تەپڵی حەسەنی بیست و لەیەك فەرسەخییەوە بۆ پێشوازی ئەو ڕۆشت. حەسەن پێی وت: لێرە چی دەکەیت و بۆ شوێنەکەی خۆت بەجێهێشتووە؟ دەستت بەسەر کوێستانی شەرویندا گرت و دووبارە بەجێتهێشت، ئایا ناترسی خەڵکان ڕێگەی فرت و فێڵ بگرنەبەر و ئەوەی بەدەستمان هێناوە، لەدەستی بدەین؟ بگەڕێرەوە چوونکە مەبەستی خەڵەتاندنی تۆیان لەسەردایە بەڵام دەرفەتی گونجاویان دەست ناکەوێت. حەییان وەڵامی دایەوە: نیازی گەڕانەوەم هەیە، بڕیارمداوە کەل و پەلەکان کۆبکەمەوە و فەرمانی گەڕانەوە بەکەسەکانم بدەم. حەسەن پێی وت: تۆ بڕۆ، خۆم ئەوان بەرێدەکەم.

حەییان بەپێی فەرمانی حەسەن هەمان سات بەرێکەوت. لەم کاتەدا نامەی عەبدوڵڵە کوڕی تاهیر بەدەستی حەسەن گەیشت تا لەکور لەکوێستانەکانی وەنداد ئوردوو لێبدات. ئێرە بەهێزترین شوێنی ئەو ناوچەیە بوو. سامانی فراوانی مازیار لەو ناوچەیە کەڵەکە کرابوو. عەبدوڵڵە فەرمانیدا ئەوەی قارن لەسامان و زەوی داوای دەکات، پێی بدەن (سامانەکانی مازیار لەناو قەڵاکەی پێ بدرێت)

قارن ئەوەی دەیخواستە لەسامانی مازیار و سەرخاستان هەڵیگرت.

کاروبارەکانی حەییان شێوا (کوهیار خۆی تەسلیم نەکرد). هۆکاری شێوانی کاروبارەکان تەماحی ئەو بۆ گرتنی ئەسپەکەی ئەحمەد بوو. دواتر حەییان مرد و عەبدوالله، مامی خۆی، محەممەد کوڕی حسەین کوڕی موسعەبی لەجێگەی ئەودانا. حەسەن کوڕی حسەین ڕێگەی خورەم ئابادی گرتەبەر، محەممەد کوڕی موسا کوڕی حەفس و ئەحمەد کوڕی سەقەر پەیوەستی بوون. ڕێزی لەهەردووکیان گرت و نامەیەکی بۆ کوهیار نووسی و بانگی کرد. ڕێزی لێ گرت و چاکەی لەگەڵ کرد و ئەوەی دەیخواست، پێی بەخشی. ڕۆژێکیان دیاریکرد تا مازیار بگرن.

کوهیار بۆ لای مازیار گەڕایەوە و ئاگاداری کردەوە کەئەمانی بۆ وەرگرتووە و ئەوی دڵنیا کرد. حەسەن لەڕۆژی دیاریکراو لەکاتی نیمەڕۆ لەگەڵ سێ کۆیلەی تورك بەڕێکەوت و ئیبراهیم کوڕی میهران ڕێنشیاندەری ئەوان بوو تا ڕێگەی ئورمیان نیشان بدات. کاتێك نزیك بوونەوە، ئیبراهیم ترسا و وتی: ئەمە ڕێگەیێکە تەنیا لەگەڵ هەزار سوار دەتوانین بیبڕین. حەسەن قیژاندی: بڕۆ. وتی: منیش ڕۆشتم بەلاّم ئاوزی خۆم لەدەست دابوو تا گەیشتمە ئورم. حەسەن وتی: ڕێگەی هورموز ئاباد کامەیە؟ وتم: لەم کێو و دۆڵە. وتی: بەرەو هورموز ئاباد بڕۆ. وتم: هاوار خوایە. هاواری کرد و وتی: بڕۆ دایك بۆگەن. وتم: ئەگەر تۆ بەشمشێر سەرم بپەڕێنیت باشترە لەوەی مازیار ماچم بکات و عەبدوواللەی ئەمیر سەرکۆنەم بکات. لەم کاتەدا حەسەن بەشێوەیەك بۆ پێشەوە پاڵی پێوەنام کەگومانم کرد هێرشی کردۆتە سەرم. بەترسەوە ڕێگەم دەبڕی و لەکاتی ئاوابوونی هەتاو گەشتینە هورموز ئاباد. دابەزی و دانیشت. هەموومان بەڕۆژوو بووین.

سوارەکان دەستە دەستە لەڕێگەدا بوون چوونکە لەڕۆشتنی فەرماندەکەیان ئاگادار نەبوون و ماوەیەك دوای ئەو ملی ڕێگەیان گرتەبەر. کاتێك گەیشتین، نوێژی ئێوارێمان خوێند، لەکاتی شەودا چەندین سوارمان بینی کەمۆمەکان بەردەمیان ڕووناك دەکردنەوە. ئەوان لەڕێگەی لەبورەوە دەهاتن. حەسەن وتی: ڕێگەی لەبورە کامەیە؟ وتم: ڕێگە دەبینم لەگەڵ دەستەیەکی مۆم بەدەست. سەرمسوڕما بوو، لەچەند و چۆنیەتی کارەکە ئاگادار نەبووم تا ئەوەی مۆمەکان نزیك بوونەوە. لەناکاو مازیار و کوهیارم بینی. هەردووك لەئەسپەکانیان هاتنەخوار. مازیار هاتە

پێش و سلاوی بۆ حەسەن نارد بەلام حەسەن وەلامی نەدایەوە و بەدوان لەهاوەلانی وت: ئەم دوانە بگرن و بیانبەن. ئەوانیان گرت و بردیان. بۆ بەرەبەیان، حەسەن مازیاری لەگەڵ ئەو دوو کەسەدا بۆ ساری ڕەوانە کرد و خۆی ڕێگەی هورموز ئابادی گرتەبەر و کۆشکەکەی مازیاری سوتاند و سامانەکەی تالان کرد و بەرەو خورەم ئاباد بەرێکەوت. براکانی مازیار قۆڵبەست و ڕەوانەی گرتووخانە کران. حەسەن ڕێگەی ساری گرتەبەر و ماوەیەك لەوێ مایەوە. مازیار دەست بەسەر بوو.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەب هاتە لای حەسەن کوڕی حوسەین تا سەبارەت بەبنەماڵەی مازیار گفتوگۆی لەگەڵ بکات. ئەم بابەتەیان بۆ عەبدوالله کوڕی تاهیر نووسی و چاوەڕوانی فەرمانی ئەو بوون. نامەی عەبدوالله بەدەستی حەسەن گەیشت و فەرمانی دەدا مازیار و براکان و بنەماڵەکەی بە محەممەد کوڕی ئیبراهیم بسپێرن تا بۆ بارەگای موعتەسەمیان ببات. هەروەها فەرمانیدا سامانەکەی مازیار بخەملێنێت و دەستی بەسەردا بگرێت. ئەو، مازیاری بانگ کرد و سەبارەت بەسامانەکەی لێی پرسی. مازیار وتی: ئەوەی هەمە لای خەزێنەدارەکەمە. کوهیار بەڵێنیدا دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت و چەندین کەسی کردە شایەت. مازیار وتی: بزانن و شایەت بن ئەوەی من لەسامانەکەی خۆم هەڵم گرتووە نەوەد و شەش هەزار دینار و حەڤدە دانە زەموروود و شەش نگینی یاقوت و هەشت باری قوماشی ڕەنگی و تاجێك و شمشێرێکی زێڕین و خەنجەرێی زێڕینی گەوهەر نیشان و سەوەتەیەك پڕ لەگەوهەرە کەبەهاکەی هەژدە هەزار هەزار درهەمە. من ئەم گەنجەم بە عەبدوالله کوڕی تاهیری خەزێنەدار و هەواڵ نووسی سوپاکە سپارد.

مازیار ئەم سامانەی تەسلیم کرد تا لەبەرچاوی خەڵکان بەگشتی بەدەستی حەسەن کوڕی حسەین بگات و موعتەسەم ئەمان بەخۆی و بنەماڵەکەی ببەخشێت و کوێستانی باوکی بۆ بگەڕێنێتەوە. بەلام حەسەن کەیەکێك لەداوێن پاکەکان بوو، لەوەرگرتنی سامانەکە خۆی بەدوور گرت.

بۆ بەیانی ئەو رۆژە، حەسەن، مازیاری بەیەعقوب کوڕی مەنسور بۆ دەرگای موعتەسەم ڕەوانە کرد. حەسەن فەرمانیدا سامانەکەی مازیار باری ئێسترەکان

بکەن. هەروەها مەبەستی ئەوەی کرد سوپایەکی لەگەڵدا بنێرێت بەڵام دواتر پەشیمان بوویەوە. کوهیار لەگەڵ کۆیلەکانی ڕۆشت و کاتێك گەیشتە ئەوێ، گەنجەکانی گرت و مەبەستی بردنی کرد بەڵام کۆیلەکانی مازیار قووت بوونەوە. ئەوان کەدەیلەمی بوون، پێیان وت: تۆ خیانەتت لەفەرمانڕەواکەی ئێمە کرد و ئەوت بەعەرەبەکان سپارد و هەنووکە دەخوازیت دەست بەسەر سامانەکەی بگریت. ژمارەی ئەم کۆیلانە هەزار و دووسەد کەس بوو. ئەوان کوهیاریان قۆلبەست کرد و کاتێك شەو داهات، کوشتیان و سامان و باری ئێسترەکانیان تاڵان کرد. حەسەن کوڕی حەسەن ئاگادار بوویەوە و سوپایەکی ئامادە کرد. قارنیش بەهەمان شێوە سوپای ئامادە کرد. سوپاکەی قارن دەستەیەك لەوانی گرت. یەکێك لەوان کوڕی مامی مازیار بوو بەناوی شەهریار کوڕی مەسمەغان. ئەو کۆیلەکانی بۆ شۆڕش هاندا. قارن ئەوی بۆ لای عەبدوالله کوڕی تاهیر نارد بەڵام لەکومش کۆچی دوایی کرد.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم ئاگادار بوویەوە. ئەویش دەستەیەك سەربازی نارد کەدەستیان بەسەر پاشماوەی ئەسیرەکاندا گرت و دواتر بۆ ساری ئەوانی گوێزایەوە.

دەڵێن: چۆنیەتی گرفتار بوونی مازیار کوڕە مامەکەی ئەو کوهیار بوو کەفەرمانڕەوایەتی کوێستانی تەبەرستانی دەکرد. مازیار فەرمانڕەوایەتی دەشت و داوێنەکانی تەبەرستان و سێ کێوی دیکە بەناوی وەنداد هورموزی دەکرد: فەرمانڕەوایەتی کێوێکی دیکە لەدەستی براکەی سەنجان دا بوو. کێوی شەروین لەژێر فەرمانڕەوایەتی مەلەك شەروین کوڕی سەرخاب. پێگەی مازیار بەرز بوویەوە و کوڕە مامەکەی، کوهیار یا بەگومانێك براکەی (کوهیار)ی کردە پاسەوانی بارەگای خۆی و بەنوێنەرایەتی خۆی کوێستانی بەکارگوزارێك سپارد بەناوی دەری. کاتێك مازیار شۆڕشی کرد و پێویستی بەهێز بوو، کوهیاری بانگ کرد و پێی وت: تۆ لەکەسانیتر بەکوێستانەکەی خۆت ئاشناتریت و نهێنییەکانی ئەفشین و نامە نووسینەکانی ئەوی بۆ کوهیار ئاشکرا کرد و فەرمانی پێدا بۆ کوێستانەکەی خۆی بگەڕێتەوە و بیپارێزێت. فەرمانی بەدەری دا پەیوەستی ببێت.

دەری بۆ لای مازیار گەڕایەوە و مازیار فەرماندەیی سوپاکەی پێ سپارد و ئەوی بۆ جەنگی حەسەن کوڕی حسەین مامی عەبدوللە کوڕی تاهیر ڕەوانە کرد. مازیار گومانی دەکرد بەدانانی کوهیار لەکوێستان، ئەم ناوچەیە دەپارێزێت. ئەو دەری و سوپاکەی بۆ پاراستنی ڕێگە ترسناکەکان راسپارد و بەمشێوەیە دڵنیا بوو و سوپای بۆ دەری کۆکردەوە.

مازیار لەگەڵ دەستەیەکی کەم لەشارەکەی مابوویەوە. ڕقی دڵی کوهیار بووە هۆی ئەوەی نامە بۆ حەسەن کوڕی حسەین بنووسێت و لەچۆنیەتی و چەندایەتی ئوردووگای مازیار و نهێنییەکانی ئەفشین ئاگاداری بکاتەوە. حەسەن نامەی کوهیاری بۆ عەبدوللە کوڕی تاهیر نارد و ئەویش نامەکەی ڕەوانەی بارەگای موعتەسەم کرد. عەبدوللە و حەسەن نامەیان بۆ کوهیار نووسی و بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانی بەڵێنیان پێدا. پەیمانیان بەست کوێستانی بۆ دەگەڕێننەوە و پێیان وت سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەوکەم ناکرێتەوە. کوهیار بەمە رازی و بەڵێنیدا لەرۆژێکی تایبەت کوێستان بەوان بسپێرێت.

لەرۆژی دیاریکراو، حەسەن هات و لەگەڵ دەری جەنگی. عەبدوللە سوپایەکی گەورەی نارد تا لەکێوی کوهیار گوزەر بکات. کوهیار ڕێگەی بۆ سوپاکە کردەوە و ئەوان ڕۆشتنە کوێستانەکە. کاتێك دەری لەگەڵ سوپاکەی حەسەن دەجەنگی، مازیار لەکۆشکەکەی خۆی دانیشتبوو، هێشتا نەکەوتبووە خۆ کەسوپاییەکانی حەسەنی لەبەردەم دەرگای کۆشکەکەی بینی. سوپاییەکان ئەسیریان کرد.

دەگێڕنەوە: مازیار ڕۆشتبووە شکارگە. ئەویان گرت و بۆ لای دەری یان برد کەسەرقاڵی جەنگ بوو. ئەو و هاوەڵانی کاتێك هاتنەخۆ، عەبدوللەیان لەپشت سەری خۆیان بینی کەمازیاریان لەگەڵدا بوو. سوپاکەی بڵاوەیان لێکرد و خۆی شکستی خوارد. هاوەڵانی کوژران و دوژمنان شوێنیان کەوتن و گرتیان و کوشتیان (دەری) و سەرەکەیان بۆ لای عەبدوللە کوڕی تاهیر نارد. مازیاریشیان ڕەوانە کرد. عەبدوللە کوڕی تاهیر بەڵێنی پێدا ئەگەر پەردە لەسەر نهێنیەکانی ئەفشین هەڵبگرێت لای موعتەسەم دەبێتە نێوەنجیگەر بۆ ئەوەی لەگوناحەکەی خۆش ببێت. مازیار رازی بوو و نامەکانی ئەفشینی بە عەبدوللە سپارد. عەبدوللە کوڕی

تاهیر نامەکانی بۆ ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم نارد (مازیاریشی بۆ لای ئیسحاق ڕەوانە کرد). عەبدوللە فەرمانی بەئیسحاقدا نامەکان بەدەستی موعتەسەم بگەیێنێت (تاکەس بیر لەفرت و فێڵ نەکاتەوە). ئیسحاق ئەو کارەی کرد. موعتەسەم لەمازیاری پرسی ئایا ئەمە نامەکانی ئەفشینە. مازیار رازی نەبوو. موعتەسەم بەرادەیەك ئەشکەنجەی کرد کەگیانیدا و ئەویان لای بابەك لەچوارمێخەدا.

دەڵێن: شۆڕشی مازیار لەساڵی ٨٣٩/٢٢٥ زایینی ڕوویداوە بەڵام گێڕانەوەی یەکەم راستتر بەرچاو دەکەوێت چوونکە کوژرانی ئەو لەساڵی ٨٣٩/٢٢٥ زایینی ڕوویداوە. وەك دەگێڕنەوە ئەو دانی بەنامەکانی ئەفشیندا نا، دواتر بەخواستی خواوەند، ئاماژەی پێ دەدەین.

## گەردن کێشی مەنکجور، خزمی ئەفشین

کاتێك ئەفشین کۆتایی بەکێشەکەی بابەك هێنا و بۆ سامەڕا گەڕایەوە، فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجانی بەمەنکجور یەکێك لەخزمەکانی سپارد. ئەو لەیەکێك لەزەوییەکانی بابەك گەنجێکی دەگمەنی دۆزییەوە بەڵام ئەلای موعتەسەم باسی کرد نە ئەفشین. سەرپەرەستی بەرید ڕووداوەکەی بۆ موعتەسەم نووسی بەڵام مەنکجور حاشای لەوتەکانی کرد. ئاژاوە لەنێوانیان سەری هەڵدا. مەنکجور مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام خەڵکانی ئەردەبیل ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرت (پشتیوانیان لەسەرپەرەستی بەرید کرد) مەنکجور جەنگی دژی ئەوان دەستپێکرد.

موعتەسەم لەم جەنگ و بگرەو بێنە ئاگادار بوویەوە و فەرمانی لەسەر کار لابردنی مەنکجوری بۆ ئەفشین نارد. ئەو فەرماندەیەکی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد. کاتێك مەنکجور ئاگادار بوویەوە شۆڕشی دەستپێکرد و ڕێگر و ئاژاوەچییەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و لەئەردەبیل ڕۆشتەدەر. ئەو سەرکردەی لەلایەن ئەفشینەوە ڕەوانە کرابوو، ڕووبەرووی مەنکجور بوویەوە و شکستی پێهێنا. مەنکجور بەدوای ئەم شکستە پەنای بۆ یەکێك لەقەڵاکانی ئازەربایەجان برد کەبابەك وێرانی کردبوو. سەرلەنوێ قەڵاکەی نۆژەن کردەوە و لەوێ سەنگەری گرت و ماوەی یەك مانگی لەوێ بەسەر برد. لەم بگرە وبێنەدا

هاوەڵەکانی هێرشیان کردەسەر و ئەویان تەسلیمی فەرماندەکەی ئەفشین کرد. ئەو فەرماندە، مەنکجوری بۆ سامەرا برد و موعتەسەم زیندانی کرد. بەڵام لەم ناوەدا لەئەفشینیش ڕەشبین بوو. مەنکجوریان لەساڵی ٨٣٩/٢٢٥ زاییینی هێنا و زیندانییان کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەو سەرکردەی ڕووبەرووی مەنکجور بوویەوە، بوغای گەورە بوو. مەنکجور بەوەرگرتنی ئەمان خۆی تەسلیم کرد.

## فەرمانڕەوایی عەبدوالله لەموسڵ و کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا لەدەوروبەری موسڵ یەکێك لەگەورەکانی کورد بەناوی جەعفەر کوڕی فێهرجەس ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکان شوێنی کەوتن. موعتەسەم، عەبدوالله کوڕی سەیید کوڕی ئەنسی ئەزدی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دیاری کرد و فەرمانی پێدا بۆ جەنگی جەعفەر ئامادە بێت. عەبدوالله ڕێگەی موسڵی گرتەبەر. جەعفەر دەستی بەسەر مانعیسدا گرتبوو. عەبدوالله ڕووی کردە ئەو دیارە و شەڕی لەگەڵ جەعفەر کرد و لەمانعیس دووری خستەوە.

جەعفەر ڕووی کردە کێوی داسن و لەبەرزایی کێوەکە جێگیر بوو. کەس نەیدەتوانی بگاتە ئەو شوێنە چوونکە ڕێگەیەکی باریك و دژوار بوو. عەبدوالله مەبەستی لوتکەی کێوەکەی کرد و بڕیاری بڕینی ئەو ڕێگە دژوارەیدا.

ڕێگەی بڕی و جەنگی دەست پێکرد. جەنگ دەستی پێکرد و جەعفەر و کوردەکان سەرکەوتنیان بەسەر عەبدوالله و سوپاکەی بەدەست هێنا. سەرکەوتنی کوردەکان لەبەر ئەوە بوو کێوەکەیان بەباشی دەناسی. هێزی پیادەی جەعفەر بوێر و کارامە بوون و لەبەر ئەمە عەبدوالله شکستی خوارد و زۆربەی هاوەڵانی کوژران.

یەکێك لەسوپاییەکانی عەبدوالله بەناوی ڕەباح هێرشی کردە سەر کوردەکان و ریزی سوپاکەی ئەوانی بڕی، چەندین کەسی کوشت و ژمارەیەك لەهاوەڵانی ڕزگار کرد بەڵام سەرئەنجام دەوریان گرت. ڕەباح و ئەسپەکەی بەناچاری لەبەرزایی کێوەکە خۆیان هەڵدایە ڕووبار، ئەسپەکەی گیانی بەدەر نەبرد بەڵام ڕەباح ڕزگاری بوو..

لەناو دیلەکان جەعفەر دوو عەرەبی ئەسیر کرد یەکیان بەناوی ئیسماعیل وئەوی

دیکەیان ئیسحاق کوڕی ئەنس کەمامی عەبدوالله کوڕی سەیید بوو. ئیسحاق زاوای جەعفەر بوو. جەعفەر ئەو دوانەی بانگ کرد. ئیسماعیل گومانی دەکرد مەبەستی کوشتنی ئەوی هەیە بەڵام لەبەر پەیوەندی خزمایەتی ئیسحاق ناکوژێت. وتی: ئەی ئیسحاق! وەسیەتی مناڵەکانم بەتۆ دەکەم. ئیسحاق وتی: گومان دەکەیت دەکوژرێیت و من دوای تۆ رزگارم دەبێت؟ رووی کردە جەعفەر و وتی: داوا دەکەم پێش ئەو من بکوژیت تا دڵنیا بێت. جەعفەر سەرەتا ئیسحاقی کوشت و دواتر ئیسماعیل.

کاتێك موعتەسەم ئاگادار بوویەوە، فەرمانی بەئیتاخدا بۆ جەنگی جەعفەر بەرێکەوێت. ئیتاخ سوپاکەی ئامادە کرد و لەساڵی ٨٣٩/٢٢٥ زایینی رووی کردە موسڵ و مەبەستی کێوی داسنی کرد. ئەو لەیەك شەممە بازاری تێپەڕی. جەعفەر رووبەرووی بوویەوە. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و جەعفەر کوژرا و سوپاکەی بڵاوەیان لێکرد.

دەڵێن: کاتێك جەعفەر شکستی خوارد، خۆی ژەهر خوارد کرد و مرد. ئیتاخ کەوتە گیانی کوردەکان و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت و سامانەکانی تالآن کرد و ئەسیر و ژنە تالآنییەکانی لەتکریت کۆکردەوە.

دەڵێن: جەنگی ئیتاخ لەگەڵ جەعفەر لەساڵی ٨٤٠/٢٢٦ زایینی روویداوە و خواوەند زاناترە.

## جەنگی موسوڵمانان لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان، عەبدواللەی ناسراو بەکوڕی بەلەنسی لەگەڵ سوپایەك بۆ سەرزەمینی دوژمن رەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە ئەلبە و قەلآ بەهێزەکانی. ناباوەڕان لەگەڵ سوپاکەیان رووبەرووی سوپاکەی عەبدوالله بوونەوە و شەڕێکی خوێناوی لەنێوان دوو سوپاکە دەستی پێکرد. دەرئەنجام ناباوەڕان شکستیان خوارد و ژمارەیەکیان کوژران کەلەژماردن نەدەهات. چەندین تەپۆڵکەیان لەسەری ئەوان دروست کرد بەشێوەیەك دوو سوار لەم لاولای ئەم تەپۆڵکانە یەکیان نەدەبینی.

لەم ساڵەدا لوزریق (لودریك) لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی کردە سەر شاری سالم لەشارەکانی ئاندۆلۆس و فەرتون کوڕی موسا لەگەڵ سوپایەکی گەورە رووبەرووی بوویەوە. هەردوو سوپا کەوتنە گیانی یەك. لوزریق شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی کوژران. دوای ئەم سەرکەوتنە فەرتون رووی کردە قەلآیەك کەخەڵکی ئەبلە لەبەرابەر سنووری موسوڵمانان دروستیان کردبوو. گەمارۆی خستە سەر قەلآکە و دەستی بەسەردا گرت و وێرانی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی دینار فەرمانڕەوایەتی یەمەنی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا لەجومادی الاخر، حسەین کوڕی ئەفشین لەگەڵ ئەتراجە، کچی ئەشناس پەیوەندی هاوسەر گیری بەست. لەجەژنی هاوسەرگیری ئەوان لەکۆشکی موعتەسەم، هەموو خەڵکی سامەرا بەشدارییان کرد. لەم بۆنەدا چەندین دەفری سیمینی گەورەی (بۆن) عەتر دانرابوو و خەڵکان بۆنی خۆشیان لەخۆیان دەدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی وەرەسانی لەوەرەسان شۆڕشی کرد و دواتر گوێرایەڵی خۆی نیشاندا و لەساڵی ٢٢٥/٨٣٩ زایینی داوای ئەمانی لەموعتەسەم کرد.

لەم ساڵەدا ناتسی رۆمی مرد و جەستەی ئەویان لەسامەرا، چوارمێخە کێشا، داری ئەویان لای دارەکەی بابەك بەرز کردەوە.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی مەهدی (خەلیفەی یەك ساڵی بەغداد) لەرەمەزان چاوی بەست و موعتەسەم نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند.

لەم ساڵەدا موعتەسەم، محەممەد کوڕی داودی وەك سەرپەرەستی حاجییەکان دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا لەئەفریقییە ئاژاوەیەك روویدا کە بەهۆیەوە لەنێوان عیسا کوڕی ریعانی ئەزدی لەلایەك و لەواتە و وزواغە و مەکناسە لەلایەکی دیکە جەنگ هەڵگیرسا. چەندین جەنگ لەنێوان قەفسە و قەستیلیە روویدا و عیسا هەموانی کوشتار کرد.

لەم ساڵەدا خەڵکی سجلماسە لەگەڵ مەیمون کوڕی مدرار کوڕی یەسەع پەیمانیان بەست تا وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵیبژێرن و براکەی کوڕی تەقییە کەفەرمانڕەوا بوو، لەسەر تەخت بێننە خوار. کاتێك مەیمون سەرکەوتنی بەدەست هێنا و هێزی سەقامگیر بوو، دایك و باوکی بۆ یەکێك لەگوندەکانی سجلماسە ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا نوح کوڕی ئەسەد، دەستی بەسەر کاسان و ئورەشت لەماوەرا ئەلنەهر گرت چوونکە پەیمانی ئاشتییان شکاند. ئەو دەستی بەسەر ئەسبیجاب گرت و دیوارێکی بەدەوردا کێشا و ڕەز و کێڵگە و مەزرای خەڵکی لەناو دیوارەکە پاراست.

لەم ساڵەدا باوکی عوبەید قاسم کوڕی سەلام پێشەوای زانستی نەحو لەتەمەنی شەست و حەوت ساڵی لەمەککە کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و پێنجی کۆچی ( ٨٣٩ زایینی )

## گەیشتنی مازیار بەسامەرا

لەم ساڵەدا مازیار برایە سامەرا. ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم تا دەسکەرە ڕۆشت و ئەوی گرت و سوار لەسەر ئیسترێك هێنایە ناو سامەرا چوونکە مازیار رازی نەبوو سوار فیل بێت. موعتەسەم فەرمانیدا ڕووبەڕووی ئەفشینی بکەنەوە. ئەفشین یەك ڕۆژ پێش گەیشتنی مازیار، قۆڵبەست و زیندانی کرابوو. مازیار دانی بەوەدانا ئەفشین نامەی بۆ نوسیوە و بۆ نافەرمانی کردن هانیداوە. موعتەسەم فەرمانیدا ئەفشین بۆ زیندان ببەنەوە و چوارسەد و پەنجا قامچی لەمازیار بدەن. مازیار داوای ئاوی کرد، ئاویان پێدا و هەمان سات گیانی سپارد.

وەك وترا دانپیانانی مازیار سەبارەت بەنامەکانی ئەفشین لەوشێنە جۆراجۆرەکان لەگەڵ ئەم گێڕانەوەیە ناسازگارە کەئۆباڵەکەی لەئەستۆی ئەو کەسانەدایە کەبەسەرهاتەکەیان گێڕاوەتەوە.

## توڕە بوونی موعتەسەم لەئەفشین و گرفتاری ئەو

لەم ساڵەدا موعتەسەم، لەئەفشین توڕە بوو و ئەوی خستە گرتوخانەوە.

چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو کەدەڵێن: ئەفشین لەرۆژگاری جەنگی بابەك لەسەرزەمینی خوڕەمییەکان نیشتەجێ بوو و هەرکاتێك دیارییەکی خەڵکانی ئەرمەنییەی بەدەست دەگەیشت، بۆ ئەشروسنەی دەنارد و ئەمە لەسنوری عەبدوڵلە کوڕی تاهیر تێدەپەڕی و عەبدوڵلە ئەم هەواڵەی بۆ موعتەسەم دەنووسی، موعتەسەم فەرمانی بۆ عەبدوڵلە کوڕی تاهیر دەنارد تا هەموو ئەو دیارییانەی ئەفشین بۆ ئەشروسنەی دەنێرێت نیشانە بکات و عەبدوڵلە ئەو کارەی دەکرد. ڕۆژێك نێردراوەکانی ئەفشین کەدیارییەکانیان پێبوو، لەنەیشابور دابەزین. عەبدوڵلە کوڕی تاهیر کەسی نارد و ئەوانی گرت و پکشنینی و لەناو پشتێنەکانیان چەندین هەمانەی دۆزییەوە. کیسەکانی گرت و لەچەند و چۆنیەتییەکەی پرسیاری کرد. وتیان: ئەمە دیارییەکانی ئەفشین و سامانی ئەوە.

عەبدوالله پێی وتن: درۆ دەکەن، ئەگەر ئەفشینی برام دەیویست ئەم سامانە بنێرێت، منی ئاگادار دەکردەوە تا فەرمانی ڕەوانە کردنی ئەوان بدەم، کەواتە گومانم ئەوەیە ئێوە دز بن. عەبدوالله کوڕی تاهیر پارەکەی وەرگرت و لەناو سوپاکەی دابەشی کرد و وتەکانی ئەو دەستەی بۆ ئەفشین نووسی و وتی: گومان ناکەم ئەم پارەیەت بۆ ئەشروسنە ناردبێت بێ ئەوەی ئاگادارم بکەیتەوە. ئەگەر ئەم سامانە هی تۆ نەبووە، من لەناو سوپاکەم دابەشم کردووە و ئەمە لەجیاتی ئەو بڕە پارە بێت کەسەروەری باوەڕداران سالآنە بۆمی دەنێرێت و ئەگەر ئەم سامانە هی تۆ بێت، ئەو کاتەی لەسەرەوەری باوەڕدارانەوە پارەم بەدەست بگات، بۆتۆی دەنێرمەوە و ئەگەر جیاواز لەمانە بێت، سەروەری باوەڕداران بۆ ئەم پارە شیاوترە. ئەم پارەیەم بەسوپاکەم بەخشی چوونکە دەمەوێت ئەوان بۆ سەرزەمینی تورکەکان ڕەوانە بکەم.

ئەفشین نامەی بۆ نووسی کەپارەی ئەو و سەروەری باوەڕداران یەکێکە و داوای لێکرد ئەو دەستەیە رزگار بکات تا بەرەو ئەشروسنە بڕۆن. عەبدوالله کوڕی تاهیر ئەوانی ئازاد کرد و ڕۆشتن. بەمشێوەیە ناسازگاری نێوان عەبدوالله و ئەفشین پەرەی سەند.

لەوە بەدوا عەبدوالله چاودێری کاروبارەکانی ئەفشینی دەکرد. هەندێ کات ئەفشین وتەیەکی لەموعتەسەم دەبیست کەنیشانی دەدا مەبەستی ئەوەی هەیە بنەماڵەی تاهیر لەسەر کار لاببات. ئەفیشن تەماحی فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی کرد و نامە نوسین بۆ مازیاری دەست پێکرد و بۆ سەرکێشی هانیدا. ئەو گومانی دەکرد ئەگەر مازیار یاخی ببێت، موعتەسەم، عەبدوالله لەفەرمانڕەوایەتی خوراسان دوور دەخاتەوە و ئەفشین بۆ جەنگی مازیار ڕەوانە دەکات.

یاخی بوونی مەنکجور لەئازەربایەجان بەوشێوە بوو پێشتر ئاماژەی پێدرا. موعتەسەم زانی ئەفشین لەناخەوە ڕەشبینە و لەبەر ئەمە ڕقی ئەوی لەدڵ گرت. ئەفشین هەستی بەتوڕەیی ئەو کرد بەلآم نەیدەزانی چی بکات. بەمشێوەیە بڕیاریدا لەکۆشکەکەی خۆی مەشکەکان کۆبکاتەوە و لەرۆژێك کەموعتەسەم و سەرکردەکان

سەرقاڵن، ڕێگەی موسڵ بگرێتەبەر و بەدانانی ئەم مەشکانە لەسەر ڕووباری زاب بپەڕێتەوە و خۆی بگەیێنێتە ئەرمەنستان. ئەرمەنستان لەو ڕۆژگارەدا لەژێر فەرمانی ئەودا بوو. دواتر بڕیاریدابوو بەرەو دۆڵی خەزەر بڕوات و لەسەرزەمینی تورکان بوگزەرێت و بگاتە ئەشروسنە و خەزەرییەکان دژی موسوڵمانەکان هان بدات بەڵام نەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات و ئەندێشەکەی سەرنەکەوت. بڕیاریدا سفرەیەکی گەورە ئامادە بکات، خواردنەکە ژەهراوی و موعتەسەم و سەرکردەکان بۆ سەر سفرەکەی بانگێشت بکات. ئەگەر موعتەسەم بەهۆی سەرقاڵییەوە نەتوانێت، لەگەڵ سەرکردەکان ئەوە دەکات کە لەگەڵ ئەشناس و ئیتاخ و ئەگەر توانی هەموان ژەهر خوارد بکات، لەسەرەتای شەو هەڵدێت. بەم شێوەیە بیری لە لەئەنجام گەیاندنی ئەم بیرۆکە کرد.

سەردارەکانی ئەفشین بەدوای یەك هاوشێوەی سەرکردەکانی موعتەسەم لەکۆشکی سەروەری باوەڕداران کێشکیان دەدا. لەنێوان ئەواجنی ئەشروسنی و کەسێك کەهەستی بەنهێنییەکانی ئەفشین کردبوو، گفتوگۆیەك دەستی پێکرد. ئەو کەسە بەئەواجنی وت ئەفشین ئەو کارە دەکات. ئەواجن وتی: هەرگیز کاری لەو شێوەیە سەرناگرێت و ئەفشین رزگاری نابێت. ئەو کەسە چۆنیەتی گفتوگۆکەی خۆی لەگەڵ ئەواجن بۆ ئەفشین گێڕایەوە. ئەفشین تورە و ئەواجنی جوێن باران و هەڕەشەی لێکرد. یەکێك لەکەسە نزیکەکانی ئەفشین کەهاورێی ئەواجن بوو، وتەکانی ئەفشینی بیست و لەشەو کاتێك ئەواجن لەکێشك دەگەڕایەوە، ڕۆشتە لای و لەوتەکانی ئەفشین ئاگاداری کردەوە. ئەواجن بۆ گیانی خۆی ترسا و هەمان سات ڕۆشتە کۆشکی موعتەسەم (موعتەسەم خەوتبوو) بەئیتاخی وت: ئامۆژگارییەکم بۆ سەروەری باوەڕداران هەیە. ئیتاخ وتی: سەروەری باوەڕداران خەوتووە. ئەواجن وتی: ناتوانم تا سبەی خۆم بگرم. ئیتاخ کەسێکی ئاگادار کردەوە تا موعتەسەم ئاگادار بکاتەوە. موعتەسەم وتی: پێی بڵێن: ئەم شەو بکاتە ڕۆژ. ئەواجن وتی: ئەگەر بگەڕێمەوە، گیان لەدەست دەدەم. موعتەسەم پەیامی بۆ ئیتاخ نارد تا ئەمشەو لای خۆی جێگەی بکاتەوە.

ئیتاخ ئەو شەوە جێگەی کردەوە. لەبەرەبەیاندا بەخێرایی ئەوی بردە لای

موعتەسەم و ئەواجن ئەوەی لەنهێنییەکانی ئەفشینی دەزانی، هێنایە سەرزمان. موعتەسەم فەرمانیدا ئەفشین بێننە بارەگاکەی. ئەفشین بەجل و بەرگی ڕەشەوە هات. موعتەسەم فەرمانیدا جلەکانی داکەنن و لەکۆشك زیندانی بکەن. موعتەسەم نامەی بۆ عەبدوالله کوڕی تاهیر نووسی تا کۆتایی بەکاری حسەین کوڕی ئەفشین بێنێت. لەم کاتەدا حسەین کوڕی ئەفشین لەنوح کوڕی ئەسەد فەرمانڕەوای ماوەرا ئەلنەهر سکاڵای دەکرد کەدەست درێژی دەکاتە سەر کێڵگە کشتوکاڵییەکانی ئەو. عەبدوالله کوڕی تاهیر نامەی بۆ نوح نووسی کەموعتەسەم فەرمانی گرتنی حسەین کوڕی ئەفشینی داوە و فەرمانی بەتۆیش داوە تویێشو و هێزی خۆت ئامادە بکەیت و هەرکات حسەین کوڕی ئەفشین هاتە لای تۆ، قۆڵبەستی بکەیت و بۆ لای منی (عەبدوالله) بنێرێت.

عەبدوالله نامەیەکی بۆ حسەین نووسی و ئاماژەی پێدا کە نوحی لەسەر کار لابردووە و ئەوی وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دیاری کردووە. عەبدوالله نامەی لەسەر کار لابرانی نوحی بۆ حسەین نارد. مناڵەکەی ئەفشین بەتوێشو و هێزێکی کەم هاتە لای نوح چوونکە گومانی دەکرد بۆتە فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە. لەم کاتەدا نوح قۆڵبەستی کرد و بۆ لای عەبدوللەی نارد و عەبدوالله ڕەوانەی بارەگای موعتەسەمی کرد. موعتەسەم فەرمانیدا ئەفشین بێنن تا ئەوان ڕووبەڕوو بکاتەوە. ئەویان بردە لای محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زەیات، وەزیرەکەی موعتەسەم. لەویْ کوڕی باوکی داود و ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و دەستەیەك لەگەورەکان ئامادە بوون. ئەو کەسەی گفتوگۆی لەگەڵ ئەفشین دەکرد کوڕی زەیات بوو. فەرمانیدا تا مازیار، موبد و مەرزبان کوڕی بەرکەشی یەکێك لەئەمیرەکانی سوغد و دوو کەس لەخەڵکانی سوغد بێنن. محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك ئەم دوو کەسەی بانگ کرد کەجل و بەرگی کۆنەیان لەبەردا بوو، لەو دوانەی پرسی: بەسەرهاتی ئێوە چییە؟ ئەو دوانە پشتی خۆیان ڕووت کرد. گۆشتی پشتیان شەقار شەقار ببوو. بەئەفشینی وت: ئایا دەیانناسیت؟ ئەفشین وتی: بەڵێ، یەکیان بانگبێژە و ئەوی دیکەیان پێشنوێژ کەهەردووك لەئەشروسنە بناغەی مزگەوتێکیان داڕشتووە. بەفەرمانی من یەکی هەزار قامچی لەپشتیان دراوە

چوونکە لەنێوان من و پاشای سوغد پەیمانێك بوو کەدەبوا هەموو خەڵکان لەدینەکەیان ئازاد بن بەڵام ئەم دوانە هێرشیان کردە سەر بتخانەی ئەشروسنە و بتەکانیان فرێدایەدەر و مزگەوتێکیان دروست کرد، منیش فەرمانی قامچی لێدانی ئەوانم دەرکرد. کوڕی زەیات وتی: ئەو کتێبە چییە لای تۆیە و بەزێر و گەوهەر رازاندوتەوە و هەڵگری کفری خواوەندە؟ ئەفشین وەڵامی دایەوە: ئەم کتێبەم بەمیرات لەباوکم بۆ ماوەتەوە، تیاییدا باسی ئایینی فارسەکان و کفری ئەوان دەکرێت، ئایینەکەم پەسەند و کفرەکەم پشت گوێ خست. ئەو کتێبە رازاوە بوو و بەپێویستم نەزانی زێڕ و گەوهەری لێ بکەمەوە و ئەم کارەم بەدوور لەنەریتەکانی ئیسلام نەزانیوە.

لەم کاتەدا موبد هاتە پێش و وتی: ئەمە گۆشتی ئاژەڵی خنکاوی دەخوارد و منیشی بۆ خواردن ناچار دەکرد و بەخۆشتر لەهەر ئاژەڵێکی دەزانی کەقوربانی کرابێت. رۆژێك بەمنی وت: لەگەڵ ئەم دەستە لەوەی بەناخۆشم دەزانی بوومە هاوڕێ، تا ئەو جێگەی ڕۆنم خوارد، سوار وشتر و ئێستر بووم بەڵام تا ئێستا مووی بەرەتووکی خۆم نەتاشیوە و خەتێنەم نەکردووە.

ئەفشین وتی: پێم بڵێن ئەم کەسەی قسە دەکات لەدینەکەی خۆی بڕواپێکراوە؟ موبد شوێنکەوتەی ئایینی زەردەشتی و لەرۆژگاری متوەکل باوەڕی بەئیسلام هێنا. وتیان: نا، شیاوی بڕواپێکردن نییە. ئەفشین وتی: کەواتە بۆ بەشایەتی ئەو رازی دەبن؟ بەموبدی وت: ئایا تۆم نەدەبردە ناو نهێنییەکانی خۆم و دەرگای نەوتراوەکانم بۆ تۆ نەدەکردەوە؟ وتی: بەڵێ. ئەفشین وتی: کەواتە تۆ نە لەسەر ئایینەکەی خۆت پێبەندیت و نە لەئەمەکداریدا چوونکە ئەو نهێنیەی لای تۆ باسم کرد، باست کرد.

مەرزبان هاتەپێش و وتی: خەڵکی سەرزەمینەکەت چۆن نامەیان بۆ تۆ دەنووسی. ئەفشین وتی: نایڵێم. مەرزبان وتی: ئایا بەزمانی ئەشروسنی بەو شێوەیە نامەیان بۆ تۆ نەدەنووسی؟ وتی: بەڵێ. مەرزبان وتی: ئایا واتاکەی بەعەرەبی ئەمە نییە: بۆ خوای خواکان لەفلانی کوڕی فلان؟ وتی: بەڵێ. محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك وتی: موسوڵمانان بەوتەی لەو شێوەیە رازی نابن، چیتر بۆ

فیرعەون چیت هێشتۆتەوە؟ ئەفشین وتی: خوو و عادەتی ئەوان بۆ باوکم و باوەگەورێم پێش باوەڕ هێنانی من بەو شێوە بووە و من نەمویست بەرێگرتنیان لەم کارە بۆ نافەرمانی هانیان بدەم.

لەم کاتەدا مازیاریان هێنا و بەئەفشینیان وت: ئایا نامەت بۆ ئەم پیاوە نوسیوە؟ ئەفشین وتی: نە. ئەوان بەمازیاریان وت: ئایا ئەو نامەی بۆ نوسیویت؟ مازیار وتی: بەڵێ، براکەی ئەو نامەی بۆ کوهیاری برای من نووسی کەجگە لەمن و تۆ کەسی هاوکاری ئەم دینەی نەکردووە بەلاّم بابەك بەهۆی نەزانییەوە خۆی خستە گێژاوی لەناوچوون، زۆرم هەوڵدا لەمەرگ رزگاری بکەم بەلاّم نەزانی و گومڕایی ئەوی بردە ئەو شوێنەی لەناوی برد. ئەگەر تۆ یاخی ببیت جگە لەمن کەس بۆ رووبەروو بوونەوەی تۆ نانێرن، ئەوسا سوارەکان و بوێرەکان هاورێیەتی من دەکەن. ئەگەر من بۆ جەنگی تۆ بنێرن، تەنیا سێ دەستە دژی ئێمە دەجەنگن: عەرەبەکان و مەغرببییەکان لەگەڵ تورکەکان، بەلاّم ئەم هاوکارییە دوای ماوەیەکی کەم کۆتایی پێدێت و دین دەبێتە ئەو دینەی لەرۆژگاری عەجەم دینی فەرمی بوو.

ئەفشین وتی: ئەم پیاوە بانگەشەی ئەوە دەکات کەبراکەی من نامەی بۆ براکەی نووسیوە، ئەگەر راست بێت، گوناحی من نییە و ئەگەر خۆم نامەیەکی لەو شێوەم دەنووسی لەبەر ئەوە دەبوو تا من بەکەسێکی بڕواپێکراو بزانێت بۆ ئەوەی بتوانم بیگرم و تەسلیمی خەلیفەی بکەم و لای خەلیفە پێگەم بەرز ببێتەوە بەو شێوەی عەبدوالله کوڕی تاهیر پێگەی بەرز بوویەوە. کوڕی باوکی دۆئاد بەسەر ئەفشیندا قیژاندی. ئەفشین وتی: ئەی باوکی عەبدوالله، تۆ عاباکەت لەشان دانانێت تا خوێنی دەستەیەك برێژێت. لەوەلاّمدا وتی: ئایا خەتێنە کراویت؟ ئەفشین وتی: نە. کوڕی باوکی دۆئاد وتی: بۆ نەکراویت لەکاتێکدا لەئیسلامدا دەبێت خەتێنە بکرێیت؟ ئەفشین وتی: ئایا لەئیسلامدا نابێت ئاگات لەکاروبارەکانی خۆت بێت؟ وتی: بەڵێ. ئەفشین وتی: لەوە ترسام ئەگەر ئەو ئەندامەی خۆم ببڕم، بمرم. کوڕی باوکی دۆئاد وتی: بەڕم و شمشێر بریندارت دەکەن و ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی روو نەکەیتە گۆڕەپانی جەنگ بەلاّم لەبڕینی پێستت ناتەوانیت؟ ئەفشین وتی: بریندار بوون پێویستییەکە ئەگەر رووبدات، خۆراگر دەبم بەلاّم خەتێنە کردن شتێکە

کەخۆم بەسەر خۆمیدا دەهێنم. کوڕی باوکی دۆئاد وتی: ڕاستییەکان دەرکەوت. ئەو بەبوغای گەورەی وت: بیگرە. بوغا دەستی خستە کەمەری ئەفشین و ڕایکێشا، عاباکەی کردە ملی و گەڕاندییەوە بۆ گرتووخانە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موعتەسەم، کوڕی جەعفەر کوڕی دینار (یەکێك لەسەرکردە گەورەکان بەناوی خەیات) کەخۆی لەدەستەیەك لەهاوەڵانی توڕە بوو، توڕە بوو و ئەوی بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لای ئەشناس زیندانی کرد. دواتر ئەوی بەخشی بەڵام لەفەرمانڕەوایەتی یەمەن دووری خستەوە و ئیتاخی وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەفشین لەپاسەوانی کۆشك دوورخرایەوە و ئیسحاق کوڕی یەحیا کوڕی موعاز وەك فەرمانده‌ی پاسەوانەکانی کۆشك دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس، لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەمانگی شەعبان/ ژوئەن ڕووی کردە سەرزەمینی ناباوەڕان و ڕۆشتە جەلیقییە (گالیسیا). دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت و سەرزەمینی ناباوەڕانی وێران و خاپور کرد و لەکۆکردنەوەی تالانی و کوشت و کوشتاری خەڵکان، سنووری بەزاند و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەم جەنگەوە سەرقاڵ و دواتر بۆ کوردوبا گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی دۆلفی عیجلی کەناوی قاسم کوڕی عیسا بوو و باوکی عەمرۆ جەرەمیی نەحوی کەناوی سالح کوڕی ئیسحاق بوو، مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی حەسەن عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوڵڵەی مەدائینی لەتەمەنی نەوەد و سێ ساڵی کۆچی دوایی کرد. ئەو نوسەری کتێبی موغازی (شەڕەکانی پێغەمبەر(د.خ)) و کتێبی ڕۆژگاری عەرەبی نوسیوە. هەرچەند لەبەسرە چاوی بەدنیا هەڵهێنا بەڵام لەبەر ئەوەی لەمەدائین نیشتەجێ بوو، بەو ناوە ناسرا.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و شەشی کۆچی ( ٨٤٠ زایینی )

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئیسحاق کوڕی یەحیا کوڕی موعاز کەلەلایەن ئەرتەکین سەرپەرەستی مەعونەی پێ سپێردرابوو، دژی عەلی کوڕی ڕەجا، سەرپەرەستی خەارج شۆڕشی کرد و کوشتی و بەدوای ئەوەدا خۆی بەشێت نیشاندا بەڵام ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد نێوەنجیگەری بۆ کرد و لەزیندان ئازادی کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر مرد و موعتەسەم نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند.

## چۆنیەتی مەرگی ئەفشین

لەم ساڵدا ئەفشین مرد. ئەو داوای لەموعتەسەم کردبوو تا کەسێکی بڕواپێکراو بنێرێت. موعتەسەم، حەمدون کوڕی ئیسماعیلی نارد. ئەفشین حاشای لەهەموو تۆمەت و بوختانەکان کرد و بەرگری لەخۆی کرد و وتی: بەسەروەری باوەڕداران بڵێ: داستانی من و تۆ هاوشێوەی پیاوێکە کەگوێرەکەیەکی پەروەردە، قەڵەو و بەخێو کردووە و هاوەڵانی ئەو پیاوە بیر لەخواردنی گۆشتی ئەو گوێرەکە دەکەنەوە و بەمشێوە داوای لێدەکەن گوێرەکەکە سەر بڕێت بەڵام ئەو پیاوە ئاواتەکەیان ناهێنێتەدی، ئەوانیش یەکیان گرتووە و وتیان: بۆ ئەم شێرە پەروەردە دەکەیت چوونکە ئەگەر گەورە ببێت، سرشتی شێر بوونی بەسەریدا زاڵ دەبێت. ئەو پیاوە وتی: ئەمە گوێرەکەیە. وتیان: نا، شێرە، لەهەر کەس دەخوازی بپرسە. ئەوان بەهەموو کەسە ئاشناکانی خۆیان وت ئەگەر فلان کەس سەبارەت بەگوێرەکەی پرسیاری لێکردن پێی بڵێن ئەوە گوێرەکە نییە بەڵکو شێرە. بەم شێوەیە ئەو پیاوە لەهەر کەسێکی پرسی پێیان وت ئەوە دڕندەیە. پیاوەکە گوێرەکەی سەر بڕی. من ئەو گوێرەکەم چۆن دەتوانم ببمە شێر؟ خوا لەم کارەدا فریام کەوێت.

حەمدون وتی: ئەفشینم بەجێهێشت لەکاتێکدا سەوەتەیەك میوەی لەبەردەمدا بوو کەموعتەسەم بەواسقی کوڕی ڕەوانەی کردبوو. دوای ماوەیەك کەسانی نزیکی

وتیان ئەو (دەمرێت) یا (مردووە). پێش مردن ئەویان بردە ماڵی ئیتاخ و لەوێ گیانی تەسلیم کرد. دواتر جەنازەکەیان هێنایەدەر و لای دەروازەکەی چوارمێخەیان کێشا و دواتر جەستەی بێ گیانی ئەویان داگرت و سوتاندیان. ئەم پێشهاتە لەمانگی شەعبان/ مەی روویدا.

حەمدون دەڵێت: لەکاتی گفتوگۆ لێم پرسی ئایا خەتێنەی کردووە یا نە؟ وتی: کوڕی باوکی دۆئاد لەبەرچاوی خەڵکان ئەو پرسیارەی لێکردم تا ریسوام بکات، چوونکە ئەگەر دەموت بەڵێ داوای دەکرد خۆم رووت بکەمەوە لەکاتێکدا خوازیاری مەرگم لەوەی لەبەرچاوی خەڵکان خۆم رووت بکەمەوە بەڵام ئەگەر دەخوازیت لەبەر چاوی تۆ خۆم رووت دەکەمەوە. پێم وت: تۆ کەسێکی راستگۆیت.

کاتێك حەمدون گەڕایەوە و موعتەسەمی لەو وتووێژە ئاگادار کردەوە، موعتەسەم رێگەی خواردن و خواردنەوەی لێگرت تا مرد.

دەگێڕنەوە: کاتێك دەستیان بەسەر سامانی ئەفشیندا گرت، لەناو ماڵەکەی پەیکەری مرۆڤێکی دارینیان بینی کەبەزێڕ و زیو و گەوهەر رازێنرابوویەوە. لەگوێی ئەم پەیکەرە دوو بەرد دانرابوو بەرووکەشێکی زێڕین، یەکێك لەهاوەڵانی سلێمان یەکێك لەو دوو بەردەی هەڵگرت بەگومانی ئەوەی گەوهەرە. لەکاتی شەودا ئەمەی کرد بەڵام کاتێك خۆر هەڵات، هاوشێوەی گوێچکەی ماسی بوو کەپێیان دەوت حەبرون. لەناو ماڵەکەی ئەو بت و شتی دیکەیان دۆزییەوە لەگەڵ چەندین مەشکی دارین. کتێبێك لەکتێبەکانی زەردەشتی پێغەمبەر لەناو ماڵەکەی ئەودا بینرا لەگەڵ چەندین کتێبی دیکە.

## مردنی ئەغلەب و فەرمانڕەوایی باوکی عەباس محەممەد کوڕی ئەغلەب لەئەفریقییە و بەسەرهاتی ئەو

لەرەبیع الاخر/ ژانویەی ئەم ساڵە، ئەغلەب کوڕی ئیبراهیم لەرۆژی پێنجشەممە، بیست و سێی مانگ کۆچی دوایی کرد. فەرمانڕەوایی ئەو دوو ساڵ و حەوت مانگ و حەوت رۆژ درێژەی کێشا. کاتێك مرد، کوڕەکەی باوکی عەباس محەممەد کوڕی ئەغلەب کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینی

ئەفریقییە دانیشت و خەڵکانی ئەو دیارە گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون. ئەو لەساڵی ٢٣٩/٨٥٣ زایینی لەنزیکی تاهرەت بناغەی شارێکی دارشت بەناوی عەباسییە بەڵام ئەفلەح کوڕی عەبدولوەهابی ئەبازی (لەخەواریج) شارەکەی سوتاند و نامەیەکی بۆ ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس نووسی و ئاگاداری کردەوە. فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس سەد هەزار درهەمی وەك پاداشت بۆ نارد.

محەممەد کوڕی ئەغلەب لەرۆژی دووشەممەی سەرەتای موحەرەمی ساڵی ٢٤٢/ دەی مەی ٨٥٨ زایینی مرد. فەرمانڕەوایی ئەو پانزە ساڵ و هەشت مانگ و دە رۆژ درێژەی کێشا.

## فەرمانڕەوایی کوڕەکەی ئەو باوکی ئیبراهیم ئەحمەد

کاتێك باوکی عەباس محەممەد کوڕی ئەغلەب مرد، کوڕەکەی باوکی ئیبراهیم ئەحمەد جێگەی گرتەوە. ئەو بەکردەوە چاکەکانی بەخششێکی زۆری لەناو سوپاکەیدا کرد و لەسەرزەمینی ئەفریقییە بناغەی دە هەزار قەڵای دروست کراو لەبەرد و ئاهەکی دارشت. ژمارەیەکی زۆری کۆیلەی کڕی. لەرۆژگاری ئەو هیچ شۆڕشێکی روونەدا تا پەرێشانی بکات. ئەو لەرۆژی سێشەممە حەڤدەی زیقەعدەی ساڵی ٢٤٩/ سێی نۆڤەمبەری ٨٦٣ زایینی مرد. فەرمانڕەوایی ئەو حەوت ساڵ و دە مانگ و دوانزە رۆژ بەردەوام بوو. ساڵەکانی تەمەنی لەبیست و هەشت کۆتایی پێهات.

## فەرمانڕەوایی براکەی ئەحمەد، باوکی محەممەد زیادە الله

کاتێك ئەحمەد مرد، زیادە الله جێگەی گرتەوە و شێوازی ئەحمەدی گرتەبەر. بەڵام رۆژگاری ئەوکورت و لەرۆژی شەممە نۆزدەی زی قەعدەی ساڵی ٢٥٠/ بیستی دێسامبەری ٨٦٤ زایینی مرد. بۆ ماوەی یەك ساڵ و شەش رۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## فەرمانڕەوایی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەب

کاتێك زیادەالله مرد، باوکی عەبدولله محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەغلەب جێگەی گرتەوە و ڕێگەی پێشینیانی خۆی گرتەبەر. ئەو بیرمەند و چاکەکار و ئەدیب بوو. لەرۆژگاری ئەو رۆمییەکان تەنیا توانییان دەست بەسەر چەندین ناوچە لەسەقلییە(سیسیل) بگرن. محەممەد چەندین قەڵای لەسەر کەنارەکانی دەریا دروست کرد.

لەسەرزەمینی مەغریب، شوێنێك بوو پێیان دەوت (سەرزەمینی کراوە). دووری ئەم شوێنە و بەرقە، پانزە رۆژ ڕێگە بوو. لەم سەرزەمینەدا، لەکەنار بەستێن شارێك بوو پێیان دەوت بارە و دانیشتوانەکەی مەسیحییە نارۆمییەکان بوون. حەیات، موالی ئەغلەب لەگەڵیان جەنگی بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. بەدوای ئەو خەلفونی بەربەری کەدەوترا موالی رەبیعەیە، لەسەردەمی خەلافەتی متوەکل دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. دوای ئەو سەرکردەیەك بەناوی مەفرەج کوڕی سالم هێرشی کردە سەر ئەو شارە و دەستی بەسەر بیست و چوار قەڵای شارەکەدا گرت و هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بۆ فەرمانڕەوای میسر نووسی. لەنامەکەیدا نووسی: من و هاوەڵانم نوێژ خوێندن بەبێ بوونی (ئیمام)پێشنوێژ بەڕەوا نازانین، باشترە خودەی ئەو وەك ئیمام هەڵبژێرن تا وەك کەسێکی داگیرکەر نەناسرێت. ئەوسا بناغەی مزگەوتێکی دارشت بەڵام دوای ماوەیەك هاوەڵانی لێی قوت بوونەوە و خوێنیان ڕشت. دوای ئەوەی باوکی محەممەد عەبدولله چاوی لێکنا. مەرگی ئەو لەساڵی ٨٧٤/٢٦١ زایینی روویدا. ئێمە ئاماژەمان بەفەرمانڕەوایەتی ئەم کەسانەدا چوونکە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەوان کەمە.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا ئەردهەژێنێکی قورس بۆ ماوەی پێنج رۆژ ئەهوازی لەراندەوە. ئەم ئەرد هەژێنە هاورێ بوو لەگەڵ گێژەلووکەیەك کە بەهۆیەوە خەڵکان بەناچاری ماڵەکانیان بەجێهێشت و ژمارەیەکی زۆر لەماڵەکان خاپوور بوون.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود بەفەرمانی ئەشناس رێ و رەسمی حەجی

لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەشناس لەم ساڵەدا حەجی کرد. کاتێك ئەشناس مەبەستی حەجی کرد، فەرمانڕەوایی هەر شارێك کەلێی تێدەپەڕی، بەو دەسپێردرا. لەسەر مینبەری شاری مەککە و مەدینە و ئەو شارانەی ئەشناس لێیان گوزەری دەکرد تا کاتی گەڕانەوەی بۆ سامەرا، بەناوی ئەو خوتبەیان دەخوێند.

لەم ساڵەدا باوکی هوزەیل محەممەد کوڕی هوزەیل کوڕی عەبدوللە کوڕی عەلاف بەسری، پێشەوای موعتەزیلە لەرۆژگاری خۆی، کۆچی دوایی کرد. ساڵەکانی تەمەنی زیاتر لەسەد درێژەی کێشا. چەندین بیروباوەڕی قێزەونی هێنایە ئاراوە کەتەنیا خودی ئەو ئاماژەی پێداوە.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی یەحیا کوڕی بەکر کوڕی عەبدولرەحمانی تەمیمی حەنزەلی نەیشابوری، باوکی زەکەریا لەمانگی سەفەر/ نۆڤەمبەر و سلێمان کوڕی حەرب و ئەشجی قازی و باوکی هەیسەمی رازی نەحوی، کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و حەوتی کۆچی ( ٨٤١ زایینی )

### شۆڕشی موبەرقەع

لەم ساڵەدا، باوکی حەرب موبەرقەعی یەمانی لەفەلەستین شۆڕشی کرد و ڕێگەی ناسازگاری موعتەسەمی گرتەبەر.

چۆنیەتی ڕووداوەکە بەمشێوە بوو: یەکێك لەسوپاییەکان لەنەبوونی موبەرقەع مەبەستی مانەوە لەماڵەکەی ئەوی کرد. یەکێك لەژنەکانی موبەرقەع ڕێگەی لێگرت بەلاّم ئەو کەسە قامچی لەژنەکەدا و بازوی ژنەکەی بریندار کرد. کاتێك موبەرقەع بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە، ژنەکە سکالاّی لەو کەسە کرد. موبەرقەع شمشێری هەڵگرت و ڕووی کردە ئەو پیاوە و خوێنی ڕشت و هەلاّت و ڕووخساری بەدەمامك دادەپۆشی. ڕێگەی یەکێك لەکوێستانەکانی ئەردەنی گرتەبەر و لەوێ مایەوە. ڕۆژانە روخساری خۆی بەدەمامك دادەپۆشی و هەرکەسێکی دەبینی، پێشنیاری چاکەکاری پێدەکرد و لەخراپەکان دووری دەخستەوە. ئاماژەی بەناوی خەلیفە دەدا و گوناحەکانی ئەوی ئاشکرا دەکرد. دەستەیەك لەخەڵکانی ئەو سەرزەمینە وەلاّمی بانگەوازەکەیان دایەوە.

موبەرقەع خۆی بەئومەوی دەزانی. هاوەلاّنی پێیان وت: ئەمە هەمان سوفانییە کەمژدەی هاتنی ئەویان داوە. کاتێك ژمارەی شوێنکەوتەکانی زیادی کرد، بانگەوازەکەی خۆی بەگوێی گەورەکان و سەرکردەکان گەیاند و دەستەیەك لەسەرکردە یەمانییەکان پەیوەستی بوون کەیەکیان کەسێك بوو بەناوی باوکی بەیهەس و خەڵکانی یەمەن ملکەچی فەرمانەکانی بوون. دوو کەس لەخەڵکانی دیمەشق پەیوەستی بوون.

موعتەسەم کاتێك لەم بەسەرهاتە ئاگادار بوویەوە کەشەڕی لەگەڵ نەخۆشییە گیانبڕەکەی دەکرد. ئەو، ڕەجا کوڕی ئەیوبی حەزاری لەگەڵ هەزار شەڕکەر بۆ شەڕی موبەرقەع ڕەوانە کرد بەلاّم ئەو بینی ژمارەی شەڕکەرانی موبەرقەع زیاتر لەسەد هەزار کەسە و لەبەر ئەمە جەنگی بەڕەوا نەزانی. ڕەجا لەبەرابەر ئەو ئوردووی لێدا تا ئەوەی کاتی کۆکردنەوەی بەرهەم نزیك کەوتەوە و کەسانی نزیکی

موبەرقەع بۆ سەرکارەکانی خۆیان ڕۆشتن و تەنیا هەزار یا دوو هەزار کەسی لەدەور مایەوە.

لەم کاتەدا موعتەسەم مرد و واسق جێگەی گرتەوە. شۆڕشەکەی موبەرقەع وەك ئاماژەی پێدەدرێت بۆ دیمەشق درێژ بوویەوە. واسق فەرمانی بەرەجادا رووبەرووی هەر شۆڕشگێرێك ببێتەوە و دواتر جەنگی موبەرقەع بکات. رەجا ئەو کارەی کرد و بۆ جەنگی موبەرقەع گەڕایەوە. دوو سوپا ریزیان بەست. رەجا بەهاوەڵانی وت: من لەئوردووی موبەرقەع جگە لەخۆی کەسێکی بوێر و شەڕکەر نابینم و ئەو بوێری خۆی نیشانی سەربازەکانی دەدات، کەواتە کاتێك هێرشی کرد رێگەی بۆ بکەنەوە. دوای کەمێك موبەرقەع هێرشی هێنا و هاوەڵانی رەجا رێگەیان بۆ کردەوە و لەناو ریزەکانی ئەوان گوزەری کرد، جارێکی دیکە گەڕایەوە و ریزەکانی دوژمنی بڕی و گەڕایەوە بۆ ناو هاوەڵانی خۆی. بۆ دووەم جار ئەم کارەی دووبارە کردەوە بەڵام لەکاتی گەڕانەوە، گرتیان و ئەسیریان کرد.

دەڵێن: نافەرمانی ئەو لەساڵی٢٢٦/٨٤٠ زایینی دەستیپێکرد. ئەو لەکەناری رەملە لەگەڵ پەنجا هەزار سوپای ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. موعتەسەم رەجای حەزاری بۆ جەنگی ئەو نارد و ئەو، کوڕی بەیهەسی ئەسیر کرد و نزیکەی بیست هەزار کەس لەسەربازەکانی موبەرقەع لەخوێنی خۆیاندا گەوزان. رەجا، موبەرقەعی قۆڵبەست کراو بۆ سامەرا برد.

## مەرگی موعتەسەم

لەم ساڵەدا موعتەسەم باوکی ئیسحاق محەممەد کوڕی هارون ڕەشید کوڕی محەممەدی مەهدی کوڕی عەبدوڵلەی مەنسور کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدولله کوڕی عەباس لەرۆژی پێنج شەممە، هەژدەی رەبیع الاوەل/ حەوتی نۆڤەمبەر مرد. سەرەتای نەخۆشییەکەی بەم شێوە بوو کە لەیەکەم رۆژی موحەرەم/ بیست و یەکی ئۆکتۆبەر ئاوسا و لەهەمان کات نەخۆش کەوت.

زەنامی زامر (نەی ژەن) دەڵێت: موعتەسەم لەکاتی نەخۆشییە گیانبڕەکەی هاتە خرۆش و وتی بەلەمی زوڵاڵ ئامادە بکەن تا بەناو دیجلەدا بگەڕێت. من هاوڕێیەتیم

کرد و کاتێك لەبەرابەر ماڵەکانی گوزەری کرد، پێی وتم: ئەی زەنام نەی بژەنە و خۆی ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| یا منزلا لم تبل اطلاله | حاشالاطلالك ان تبلی |
| لم ابك الطلالك لكننی | بكیت عیشی فیك اذ ولی |
| والعیش اولی ما بكاه الفتی | لابد للمحزون ان یسلی |

واتاکەی: ئەی ئەو ماڵەی نیشانەکانی هێشتا کۆن نەبووە، ئاگادار بە نیشانەکانت کۆن نەبن. من بۆ نیشانەکانی تۆ ناگریم بەڵکو بۆ رۆژگارێك دەگریم کە لەناو تۆدا سەرخۆش بووم و هەنووکە بەسەرچووە، سەرخۆشی شیاوترین شتێکە پیاو بۆی بگریت و ئەو خەمەی یەخەت پێ دەگرێت بەناچاری دەبێت دڵنەوایی بۆ بکرێت.

زەنام دەڵێت: بەردەوام نەیم دەژەنی و ئەو دەسماڵێکی بەدەستەوە بوو، دەگریا تا ئەو کاتەی گەڕاینەوە بۆ کۆشك.

کاتێك موعتەسەم لەسەر جێگەی مەرگ کەوت، بەخۆی وت: هیچ چارەیەك نەما. ئەمەی وت و بێدەنگ بوو، مرد و لەسامەرا بەخاك سپێردرا.

خەلافەتی ئەو هەشت ساڵ و هەشت مانگ و دوو رۆژ درێژەی کێشا. ساڵی لەدایك بوونی ١٧٩/ ٧٩٥ زایینی و بەوتەیەك هەشتەمین مانگی ساڵی ١٨٠/ ٧٩٦ زایینییە. ئەو هەشتەمین خەلیفە و هەشتەمین مناڵی عەباس بوو. کاتێك مرد، هەشت کوڕ و هەشت کچی لەدوای خۆی بەجێهێشت. بەپێی گێڕانەوەیەکی راست ساڵەکانی تەمەنی چل و حەوت ساڵ و دوو مانگ و هەشت رۆژ درێژەی کێشا. بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە ساڵەکانی ژیانی لەچل و حەوت ساڵ و حەوت مانگ تێنەپەڕی.

ئەو روخساری سپی و ریشی درێژ و چوارشانە و سورباو بوو. چاوەکانی جوان و لەخەلد قاری چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زیات لەپرسەی ئەودا ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| قد قلت اذ غیبوك و اصطفقت | علیك اید بالترب و الطین |
| اذهب فنعم الحفیظ كنت علی الـــ | دنیا و نعن المعین للدین |

لا يجبر الله امة فقدت مثلك الا بمثل هارون

واتاکەی: ئەو کاتەی تۆیان شاردەوە و دەستی خاك و گڵمان خستە سەر تۆ، برۆ چوونکە پارێزەرێکی باشی دنیا بوویت و بۆ دین باشترین پشتیوان، ئومەتێك تۆی لەدەست داوە خواوەند هیچ کات هاوسەنگی لەناویان ناهێنێتە ئاراوە مەگەر کەسێکی وەك هارون.

دایکی ماردە و لەکوفە چاوی بەدنیا هەڵهێنا و دایکی دایکی سوغدی بوو.

## کردەوە و هەڵس وکەوتی موعتەسەم

لەئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد دەگێڕنەوە کەئەو باسی موعتەسەمی دەکرد و بەردەوام ناو و وەسفی ئەوی دەهێنایە سەرزمان، باسی کردەوە چاکەکانی ئەوی دەکرد و دە یوت: رۆژێك لەعەموریە بووین، بەمنی وت: ئەی عەبدوللە ! ئایا خوازیاری خورمای نیوە گەیشتوو هەیت؟ وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەنووکە ئێمە لەرۆمین و خورمای نیوە پێگەیشتوو لەعێراق دەست دەکەوێت. وتی: کەمێکیان هێناوە و دەزانم تۆ حەزت لێیەتی. خورماکەیان هێنا، دەستی درێژ کرد و بۆڵێکی خاڵی بەمندا (گاڵتەی کرد)

ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد دەڵێت: لەزۆربەی سەفەرەکان هاورێی بووم.

دواتر بەم شێوەیە درێژە بەوتەکەی دەدات: من بۆ خەڵکانی شاش (چیچەن) دوو هەزار درهەمم لەموعتەسەم وەرگرت و ئەو رووبارەی لەسەرەتای ئیسلامەوە بوویان و کوێر ببوویەوە، سەر لەنویێ دروستم کردەوە.

کەسێکی دیکە وتوویەتی: کاتێك موعتەسەم توڕە دەبوو، نەدەترسا لەوەی کێ دەکوژێت وچی دەکات. ئەو حەزی بەرازاندنەوەکانی بیناکان نەدەکرد و لەکاتی جەنگ کەس لەو دەستی ئاوەڵاتر و بەخشندەتر نەبوو.

ئەحمەد کوڕی سلێمان کوڕی باوکی شێخ دەڵێت: زوبەیر کوڕی بوکار هەڵاتوو لەدەستی عەلەوییەکان هاتە عێراق چوونکە جوێنی بەعەلەوییەکان دەدا و بەم هۆیەوە هەڕەشەیان لێکرد و ئەویش هەڵات و هاتە لای مامەکەی موسعەب کوڕی عەبدوللە کوڕی زوبەیر و سکاڵای لەدەستی عەلەوییەکان بەرز کردەوە چوونکە

لێیان دەترسا. ئەو داوای لەموسعەب کرد موعتەسەم لەم پێشهاتە ئاگادار بکاتەوە بەڵام مەسعەب مەبەستەکەی نەهێنایەدی چوونکە کارەکەی بەقێزەون لەقەڵەمدا و سەرکۆنەی کرد.

ئەحمەد دەڵێت: ئەو هاتە لای من و سکاڵای کرد و داوای کرد لەگەڵ مامی قسە بکەم. من لەگەڵ مامی قسەم کردم و ئاوڕنەدانەوەی ئەوم لەزوبەیر بەکارێکی نەشیاو لەقەڵەمدا. مامی پێی وتم: زوبەیر نادان و توندڕەوە، داوای لێ بکە دڵنەوایی عەلەوییەکان بکاتەوە و بێزاری ئەوان لەخۆی بسڕێتەوە. وتی: ئایا نەتبینی مەئمون چۆن دڵنەوایی ئەوانی دەکرد و لەگوناحەکانیان خۆش دەبوو؟ وتم: بەڵێ، سوێند بەخوا سەروەری باوەڕدارانیش چاکە لەگەڵ عەلەوییەکان دەکات و من ناتوانم لای ئەو بەخراپە باسی یەکێك لەعەلەوییەکان بکەم، کەواتە بەبرازاکەم بڵێ دەست لەکارەکانی خۆی یانی سەرکۆنە کردنی عەلەوییەکان هەڵگرێت.

ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی موسعەبی دەڵێت: ڕۆژێك موعتەسەم بانگی کردم، ڕۆشتمە لای. پێی وتم: ئیسحاق! حەز دەکەم گەمەی چۆگان لەگەڵ تۆ بکەم. کاژێرێك یاریمان کرد، دواتر موعتەسەم لەئەسپەکەی هاتەخوار. دەستی منی گرت و پیاسەمان دەکرد تا گەیشتینە گەرماو. بەمنی وت: ئیسحاق، جلەکانی من داکەنە. جلەکانی ئەوم داکەند. فەرمانی پێدام جلەکانی خۆم داکەنم. ئەو کارەم کرد. ڕۆشتینە ناو گەرماوەکە بێ ئەوەی خزمەتکارێکمان لەگەڵدا بێت. هەستام و ئەوم شۆرد، موعتەسەمیش منی شۆرد، داوام لێکرد ئەو کارە نەکات بەڵام ڕازی نەبوو. دواتر هاتینە دەر و پێکەوە ڕێگەمان بڕی تا گەشتە کۆشکەکەی و خەوت. فەرمانی بەمنیش دا بخەوم. منیش سەرەتا ڕازی نەبووم بەڵام دواتر لەبەرابەر ئەو خەوتم. موعتەسەم بەمنی وت: ئەی ئیسحاق! شتێکم لەدڵدایە زەمانێکی درێژە بیری لێ دەکەمەوە، بۆیە تۆم لای خۆم خەواند تا باسی بکەم. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران بڵێ، من بەندەو زادەی بەندەی تۆم. وتی: سەیری کاری مەئمونی برام کرد، ئەو چوار کەسی هەڵبژارد و هەر چواریان لەکارەکانی خۆیان ڕاست کردار و ناودار بوون بەڵام من چوار کەسم هەڵبژارد بەڵام هیچیان سەرکەوتوو نەبوون. وتم: مەئمون ڕێزی لەچ کەسانێك گرت؟. وتی: تاهیر کوڕی حسەین کەبینیت و بیستت،

کوڕەکەی تاهیر عەبدوللە کوڕی تاهیر کەپیاوێکی بێ وینەیە و تۆ کەسوێند بەخوا دەوڵەت کەسێکی وەك تۆی تیا نییە و براکەت محەممەد کوڕی ئیبراهیم. من چاکەم لەگەڵ ئەفشین کرد و سەرئەنجامی کارەکەیت بینی، ئەشناس کەرزگاری نەبوو و ئیتاخ کەکەسێکی کەم بەهایە و وەسیف کەتوانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نییە. وتم: ئایا ئەگەر وەلامی ئەو پرسیارەت بدەمەوە لەتوڕەیی تۆ پارێزراو دەبم؟ وتی: بەڵێ. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، براکەت سەیری ڕگی دەکرد و ئەوانی بۆ کاروبارەکان رادەسپارد بەلاّم تۆ سەیری لقەکان دەکەیت کەڕەگیان نییە. موعتەسەم وتی: ئەی ئیسحاق، بەرگە گرتنی ئەم ڕەنجە ئاسانتر بوو لەوەلاّمەکەی تۆ.

کوڕی باوکی دۆئاد(قازی) وتی: موعتەسەم سەد هەزار درهەمی پێدام تا لەلایەن ئەوەوە وەك خێر لەناو خەڵکان دابەشی بکەم.

دەگێڕنەوە: موعتەسەم لەرۆژێکی بارانی لەهاوەلانی جیا بوویەوە. لەکاتی گەڕاندا پیرەپیاوێکی بینی کەکەرەکەی بەبارە چقڵەوە خزابوو و لەقوڕ چەقیبوو. پیرەپیاو چاوەڕوانی کەسێکی دەکرد تا هاوکاری بکات. موعتەسەم پرسیاری لێکرد و پیرەپیاو وتی: کەر و بارەکەم لەقوڕ چەقیوە و هاوکاریم دەوێت. موعتەسەم هاتەخوار تا کەرەکە لەقوڕ دەربێنێت. پیرەپیاو وتی: دایك و باوکم بەقوربانی تۆ بێت، خۆت قوڕاوی مەکە. موعتەسەم وتی: کێشە نییە. کەرەکەی دەرهێنا و بارەکەی لێ بار کردەوە، دواتر دەستی شۆرد و سوار ئەسپەکەی بوویەوە. پیرەپیاو وتی: ئەی گەنج، خوا لەگوناحەکانت خۆش بێت. موعتەسەم پەیوەستی هاورێکانی بوویەوە وتی: چوار هەزار درهەم بەو پیرەپیاوە بدەن و کەسێکی نارد تا تاکو ماڵەکەی هاوڕێیەتی بکات.

## خەلافەتی واسق باللە

لەم ساڵەدا بۆ واسق باللە هارون کوڕی موعتەسەم لەرۆژی مەرگی باوکی بەیعەت وەرگیرا. ئەو رۆژە پێنج شەممە هەژدەی رەبیع الاوەلی ٢٢٧/ حەوتی نۆڤەمبەری ٨٤١ زایینی بوو. نازناوی ئەوباوکی جەعفەر و دایکی دایکی مناڵی رۆمی بوو کە بەقەراتیس ناودەبرا.

هەروەها لەم ساڵەدا تۆفیلی پاشای ڕۆم مرد. ئەو دوانزە ساڵ پاشایەتی کرد. دوای ئەو هاوسەرەکەی تودووەرە کەهێشتا کوڕەکەی میخائیل کوڕی تۆفیل منال بوو، لەسەر تەخت دانیشت.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی موعتەسەم ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. دایکی واسق کە لەگەڵ ئەو حەجی دەکرد لەمانگی زیحەججە لەحیرە کۆچی دوای کرد و لەکوفە بەخاك سپێردرا.

## شۆرشی دیمەشق

کاتێك موعتەسەم مرد، قەیسییەکانی دیمەشق ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و خراپەکاری زۆریان هێنایە ئاراوە و گەمارۆیان خستە سەر فەرماندارەکەیان. واسق، ڕەجا کوڕی ئەیوبی حەزاری بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەوان لەمەرج ڕاهیت کۆببوونەوە. ڕەجا لەدێری موڕان ئوردوی لێدا و پێشنیاری پێکردن ملکەچی و گوێڕایەڵەی خۆیان دەربڕن بەلاّم ئەوان دەستیان لەنافەرمانی هەڵنەگرت. ڕەجا ڕۆژی دووشەممەی وەك ڕۆژی جەنگ لەگەڵ ئەوان و لەناوچەی دومە دەستنیشان کرد.،

بۆ ڕۆژی یەکشەممە هەموویان بلاّوەیان لێکرد و ڕەجا هێرشی کردە سەریان. تەنیا ژمارەیەکی کەمی ئەوان هاتبوونە ناوچەی دومە و ژمارەیەکیان شوێن کاری خۆیان کەوتبوون. ڕەجا شەڕی لەگەڵ کرد و توانی شکستیان پێ بێنێت. هەزار و پێنسەد کەسی لێ کوشتن و سێسەد کەس لەهاوەڵانی خۆی کوژران. کوڕی بەیهەس، پێشەوای شۆڕشگێرەکان هەلاّت و ئارامی بۆ دیمەشق گەڕایەوە.

ڕەجا ڕێگی فەلەستینی گرتەبەر تا لەگەڵ باوکی حەرب موبەرقەع بجەنگێت کە لەو سەرزەمینە شۆڕشی دەستپێکردبوو. ڕەجا لەگەڵ باوکی حەرب جەنگی و وەك پێشتر ئامارەمان پێدا شکستی پێهێنا و ئەسیری کرد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بیشر کوڕی حارسی خواپەرەست ناسراو بەپێ پەتی لەمانگی رەبیع الاوەل، دێسامبەر و عەبدولرەحمان کوڕی عوبەیداللە کحەفس کوڕی عومەر کوڕی موسا کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەعمەری تیمی ناسراو بە کوڕی عائیشەی بەسری کۆچی دواییان کرد.

عەبدولرەحمانیان بەکوڕی عائیشە ناو دەبرد چوونکە لەمناڵەکانی عائیشە کچی تەڵحە بوو. ساڵێك دوای ئەم ساڵە باوکی عەبدولرەحمان، عوبەیداللە کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی باوکی ئەویس کە لەساڵی ٨٥٣/٢٣٩ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا مرد، ئەحمەد کوڕی عەبدوللە کوڕی یونس و باوکی وەلیدی تەیالسی و هەیسەم کوڕی خاریجە، مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ سەرزەمینی دوژمن رەوانە کرد. کاتێك گەیشتنە ئەربونە و شەرتانییە، رۆمییەکان هێرشیان کردنەسەر و گەمارۆیان خستە سەر ئوردووگاکەیان و شەویان بەجەنگ بەسەر برد. بەرەبەیان خواوەند فریای موسوڵمانان کەوت و شکستی بەدوژمنان هێنا. موسا کوڕی موسا لەم جەنگەدا بوێری لەخۆی نیشاندا و پێگەی بەرز بوویەوە. ئەو فەرماندەی سوپای موسوڵمانان بوو. لەنێوان ئەو و جەریر کوڕی موەفەق لەگەورەکانی حکومەت ناسازگاری هاتە کایەوە و ئەمە بووە هۆی یاخی بوونی موسا لەبەرابەر عەبدولرەحمان.

لەم ساڵەدا ئەزفونش، شەهریاری رۆم، لەئاندۆلۆس چاوی بەدنیا هەڵهێنا. فەرمانڕەوایی ئەو شەست و دوو ساڵ درێژەی کێشا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی حەسانی یەحسەبی، فەقیهی مالکی، لەخەڵکانی ئەفریقییە کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و هەشتی کۆچی ( ٨٤٢ زایینی )

## جەنگەکانی موسوڵمانان لەدورگەی سیسیل

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی جەعفەری هەمەدانی هێزی دەریایی کۆکردەوە و لەلەنگەرگەی مەسینی دابەزی و دەستە جەنگاوەرەکانی خۆی بۆ هەموو ناوچەکانی ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد و تالآنی فراوانی کۆکردەوە. خەڵکانی ناپول داوای ئەمانیان کرد و هاوکارییان کرد. فەزڵ بۆ ماوەی دوو ساڵ لەم دوورگەیە جەنگی بەڵام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت. دەستەیەك لەسوپاکەی ڕۆشتنە پشت کێوێکی شارەکە و لەوێوە ڕۆشتنە ناو شارەکە. کاتێك لەشارەکە دابەزین بینیان خەڵکەکەی سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ جەعفەر و هاوەڵانی ئەون. کاتێك خەڵکانی شار موسوڵمانانیان بینی لەپشتەوە هێرشیان دەکەنە سەر، ورەی خۆیان دۆڕاند و شکستیان خوارد و دوورەگەکە لەلایەن موسوڵمانانەوە دەستی بەسەردا گیرا.

لەم ساڵەدا شاری مەسکان دەستی بەسەردا گیرا.

لەساڵی ٢٢٩/ ٨٤٣ زایینی باوکی ئەغلەب عەباس کوڕی فەزڵ لەگەڵ سوپایەك ڕێگەی شەرەی گرتەبەر و لەگەڵ خەڵکەکەی جەنگی. شەڕێکی قورس دەستیپێکرد و سەرئەنجام ڕۆمییەکان شکستیان خوارد و زیاتر لەدە هەزار سەربازیان لێ کوژرا. تەنیا سێ کەس لەموسوڵمانان کوژرا.

لەساڵی ١٣٢/ ٨٤٣ زایینی فەزڵ کوڕی جەعفەر گەمارۆی خستە سەر شاری لەنتینی چوونکە ئاگاداریان کردبوویەوە کەخەڵکی ئەم شارە نامەیان بۆ بەتریقی سیسیل (سەقلیبە)نووسیوە و داوای هاوکارییان کردووە و ئەوەیش رازی و لەوەڵامدا وتوویەتی: نیشانەی گەیشتنی من ئەوەیە لەفلآنە کێوە بۆ ماوەی سێ شەو ڕۆژ ئاگر هەڵدەگیرسێت، کاتێك ئاگرەکەتان بینی لەچوارەم ڕۆژ دێمە لاتان و هەموان لەناکاو هێرش دەکەینە سەر موسوڵمانەکان.

فەزڵ کەسی نارد تا بۆ ماوەی سێ شەو لەو کێوەدا ئاگر بکاتەوە. کاتێك خەڵکانی لەنتینی ئاگرەکەیان بینی، خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد. فەزڵ هێزەکانی

خۆی کۆکردەوە و بۆسەی دانا. فەرمانی بەسەربازەکانیدا لەکاتی هێرشی خەڵکان بۆ سەر ئەو سوپایەی دەوری شارەکەیان گرتبوو، بۆ هەڵخەڵتاندیان خۆیان بەشکست خواردوو نیشان بدەن تا ئەوان لەبۆسەکان نزیك بکەنەوە و کاتێك گەیشتنە شوێنی دیاریکراو، گەمارۆیان بخەنەسەر.

لەکاتی چوارەم رۆژ خەڵکانی لەنتینی ئالأی شۆڕشیان بەرز کردەوە وجەنگیان دژی موسوڵمانان دەست پێکرد. موسوڵمانان وایان نیشاندا شکستیان خواردووە و بەمشێوەیە رۆمییەکانیان لەشوێنی مەبەست نزیك کردەوە بەشێوەیەك شارەکە کەسی تیا نەما. کاتێك رۆمییەکان لەشوێنی مەبەست گوزەریان کرد، موسوڵمانان گەڕانەوە و ئەوانەی بۆسەیان دانابوو، هاتنەدەر و شمشێریان دەرکێشا و هێرشیان کردنەسەر. تەنیا ژمارەیەکی کەم لەرۆمییەکان توانیان خۆیان رزگار بکەن. رۆمییەکان داوای ئەمانیان کرد بەو مەرجەی ماڵ و سامانەکانیان هەڵگرن و شارەکە بەموسوڵمانان بسپێرن. موسوڵمانان رازی و رۆمییەکان شارەکەیان بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا موسوڵمانان لەشاری تارەنت لەسەرزەمینی ئەنکبوردە نیشتەجێ بوون و ئەو سەرزەمینەیان وەك دیاری خۆیان هەڵبژارد.

لەساڵی ٨٤٧/٢٣٣ زایینی دە کەشتی جەنگی رۆمی لەلەنگەرگای تین لەنگەریان گرت. ئەوان بیریان لەهێرشی لەناکاو دەکردەوە بەڵام رێگەیان ون کرد و دەست بەتاڵ گەڕانەوە. لەکاتی گەشتەکەیان لەدەریا، حەوت کەشتی جەنگی ئەوان بووە خۆراکی شەپۆلەکانی دەریا.

لەساڵی ٢٣٤/ ٨٤٨ زایینی خەڵکانی رەغوس رێگەی ئاشتییان لەگەڵ موسوڵمانان گرتەبەر و شارەکەیان تەسلیم بەموسوڵمانان کرد. موسوڵمانان شارەکەیان وێران و سامانەکانیان تالأن کرد.

لەساڵی ٨٤٩/٢٣٥ زایینی دەستەیەك لەموسوڵمانان بەرەو شاری قەسریانە بەرێکەوتنە و تالأنی زۆریان کۆکردەوە و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ژمارەیەکیان فڕاند.

فەرمانداری سیسیل بەنوێنەرایەتی موسوڵمانان محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی

ئەغلەب بوو کە لەرەجەبی ساڵی ٢٣٢/ فەوریەی ٨٤٦ زایینی مرد.، ئەو لەشاری بەلەرم نیشتەجێ ببوو. خۆی لەشارەکە نەدەهاتەدەر و تەنیا سوپاییەکانی بۆ گرتنی شارەکانی دیکە ڕەوانە دەکرد و ئەوانیش دەستیان بەسەر شارەکاندا دەگرت و تالآنییان کۆدەکردەوە. نۆزدە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## جەنگی موسا کوڕی موسا لەگەڵ حارس کوڕی یەزیغ

لەم ساڵەدا لەنێوان موسا کارگوزاری تولدۆ (تەتەڵییە) و سوپاکەی عەبدولرەحمان پاشای ئاندۆلۆس جەنگێك بەفەرماندەیی حارس کوڕی یەزیغ ڕوویدا.

هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو لەنێوان موسا کوڕی موسا فەرماندەی بەناوبانگی عەبدولرەحمان و کارگوزاری شاری تۆڵدۆ و سەرکردەکانی دیکە لەساڵی ٢٢٩/ ٨٤٣ زایینی رق وئاژاوە و رژدی بردن هاتە ئاراوە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. بەمشێوەیە موسا کوڕی موسا لەبەرابەر سوپاکەی عەبدولرەحمان قوت بوویەوە. عەبدولرەحمان سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و حارس کوڕی یەزیغ و چەند سەرکردەیەکی دیکەی وەك فەرماندەی سوپاکە دەستنیشان کرد. جەنگێکی قورس لەنێوان ئەم دوو سوپا لەبەرجە ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی موسا کوژران کەکوڕە مامەکەی لەناویاندا دەبینرا و حارس بۆ ساراگوزا گەڕایەوە. موسا کوڕەکەی خۆی ئەلب کوڕی موسای ڕەوانەی بەرجە کرد. حارسیش ڕێگەی بەرجەی گرتەبەر و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و کوڕەکەی موسای کوشت و بۆجەنگی باوکی بەرێکەوت. موسا هاتە لای حارس. موسا لەسەر ئەو بنەمایە ئاشتی کرد کەلەوێ بڕواتەدەر. بەمشێوەیە موسا ڕێگەی ئەرنیتی گرتەبەر. حارس چەند ڕۆژێك بەدوایدا گەڕا و سەرئەنجام ئەویش ڕێگەی ئەرنیتی گرتەبەر و لەوێ دەوری موسای گرت. موسا کەسێکی بۆ لای غەرسییە یەکێك لەپاشا ناباوەڕەکانی ئاندۆلۆس نارد و داوای هاوکاری لێکرد. هەردووك بۆ جەنگ دژی حارس یەکیان گرت و هێزی خۆیان کۆکردەوە و لەسەر ڕێگەی حارس بۆسەیان نایەوە. ئەوان سوپاکەی خۆیان لەکەنار ڕووبارێك بەناوی بەلمەسە ڕازاندەوە. کاتێك حارس هاتە

کەنار رووبارەکە، ئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، هاتنەدەر و دەوریان گرت و ئاگری جەنگێکی مەترسیدار بلێسەی سەند. لەم جەنگەدا روخساری حارس بریندار بوو کە بەهۆیەوە چاوی دەرپەڕی و بەئەسیری گیرا.

عەبدولرەحمان بەبیستنی ئەم هەواڵە نیگەران بوو. سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد و محەممەدی کوڕی وەك فەرماندەی ئەو سوپایە دەستنیشان کرد و لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٢٢٩/ مەی ٨٤٣ زایینی بۆ جەنگی موسای نارد. محەممەد گەیشتە بەنبەلونە (پامپلونا) و لەوێ رووبەرووی دەستەیەك لەناباوەڕان بوویەوە. لەم جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لەناباوەڕان کوژران.

موسا جارێکی دیکە سەرپێچی فەرمانەکانی عەبدولرەحمانی کرد. عەبدولرەحمان سوپایەکی گەورەی رازاندەوە و بۆ جەنگی موسا ڕەوانەی کردن. کاتێك موسا ئەمەی بینی، پێشنیاری ئاشتی کرد و عەبدولرەحمان رازی بوو. موسا، ئیسماعیلی کوڕی وەك بارمتە دانا. عەبدولرەحمان دووبارە فەرمانڕەوایی شاری تۆڵدۆی بەموسا سپارد. کاتێك موسا گەیشتە شارەکە، نەیارەکانی خۆی دەرکرد و بەئارامی لەو شارەدا مایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵدا واسق تاجێك و دوو مەدالیای بەئەشناس بەخشی.

لەم ساڵەدا باوکی تەمام حەبیب کوڕی ئەوسی تائی وتاردەر مرد.

لەم ساڵەدا بەهاکان لەسەر رێگەی مەککە بەرادەیەك گران بوو کەبایی هەر ڕەتڵ نان بۆ یەك درهەم و هەر مەشکەیەك ئاو بۆ چل درهەم بەرز بوویەوە. خەڵك لەکاتی حەج گرفتاری گەرمایەکی سوتێنەر بوون. بەدوای ئەم گەرمایە باران باری و هەوا فێنك بوویەوە و کاژێرێك دواتر ساردی هەوا زیادی کرد و بەهۆی بارینی بارانی زۆرەوە بەشێك لەکێوەی جەمرەی عوقبە بەسەر حاجییەکان داڕما و ژمارەیەکی لەحاجییەکان کوشت.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی مالك کوڕی عەبدولعەزیز باوکی نەسری تەمار

لەنەوەد و یەك ساڵی مرد. ئەو پێش مردنی کوێر ببوو.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی عومەر کوڕی معاویەی کوڕی عەمرۆ کوڕی عوتەبە کوڕی ئەبوسوفیانی عوتەبی ئومەوی بەسری و باوکی عەبدولرەحمان کەشارەزای ئەدەب و دیرۆك بوو، مردن. هەروەها سلێمان داودی ئەشقەری سمساری حەدیس بێژ کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و بیست و نۆی کۆچی ( ٨٤٣ زایینی )

لەم ساڵەدا واسقی خەلیفە، دەبیرەکان و کارمەندانی دیوان و مستەوفییەکانی زیندانی کرد و بەدانی سامانێکی زۆر ناچاری کردن. ئەو قامچی لەئەحمەد کوڕی ئیسرائیلدا و دووسەد هەزار دیناری لیَ سەند. لەسلێمان کوڕی وەهب، دەبیری ئیتاخ چوارسەد هەزار دینار، لەحەسەن کوڕی وەهب چواردە هەزار دینار، لەئیبراهیم کوڕی ڕەیاح و دەبیرەکانی ئەو سەد هەزار دینار، لەئەحمەد کوڕی خەسیب و دەبیرەکانی هەزار هەزار دینار، لەنەجاح شەست هەزار دینار و لەباوکی وەزیر سەد و چل هەزار دیناری سەند.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو شەوێك واسق لەگەڵ هاوەڵانی دانیشتبوو کەیەك لەوان سەبارەت بەبەدبەختی بەرمەکییەکان پرسیاری کرد. عەرود کوڕی عەبدولعەزیزی ئەنساری وتی: هارون ڕەشید مەبەستی کڕینی کەنیزی عەدولی[١٦] خەیاتی کرد و بەسەد هەزار دینار کڕی وکەسی بەدوای یەحیا کوڕی خالید (وەزیر) نارد و فەرمانی پێدا سەد هەزار دیناری بۆ ڕەوانە بکات. یەحیا وتی: ئەمە سەرەتای خراپەکارییە، ئەگەر توانای ئەوەی هەبێت کەنیزێك بەسەد هەزار دینار بکرێت، دەبێت خەرجی ژیانی ئەووەند بێت. یەحیا پەیامی بۆ هارون نارد: ناتوانم ئەم بڕە پارەیە بدەم. ڕەشید توڕە بوو و دووبارە کەسی نارد کەدەبێت بەناچاری ئەم پارەیە بدەیت. یەحیا بەئەندازەی دینار، درهەمی نارد و فەرمانیدا لەسەر ڕێگەی هارون باری بکەن بۆ ئەوەی بەزۆری بزانێت. ئەو کارەیان کرد. کاتێك ڕەشید لەڕێگە گوزەری دەکرد، ئەم بارەی بینی و پرسیاری کرد. وتیان: بەهای کەنیزەکەی تۆیە. هارون بەزۆری زانی و فەرمانیدا کەنیزەکە بگێڕنەوە و فەرمانی بەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆیدا پارەکە هەڵگرێت و گەنجینەیەکی بۆ دروست بکات و ئەم پارەیە لەویَ دابنێت تا هەرکات ویستی پێی زیاد بکات. ئەو گەنجینەی بەگەنجخانەی بووك (بیت العروس) ناوبرد. دواتر لێکۆڵینەوەی لەسامانی کەسان کرد. بینی بەرمەکییەکان بەرادەیەك دەوڵەمەندن کەسامانی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن.

---

[١٦] لەمێژووی تەبەریدا بەعەمون هاتووە (وەرگێر)

لەناو ئەو کەسانەی شەوانە هاونشینی هارون بوون، یەکیان شارەزای ئەدەب بوو کە بەباوکی عود ناو دەبرا. شەوێك هارون فەرمانی بەیەحیادا سی هەزار درهەمی پێ بدات بەڵام یەحیا ئەو کارەی نەکرد. باوکی عود بەدوای دەرفەتێك دەگەڕا تا هارون دژی بەرمەکییەکان هەڵخرێنێت. توڕەیی ڕەشید لەبەرمەکییەکان لەناو خەڵك بڵاو ببوویەوە. شەوێك کەباوکی عود لای هارون بوو، قسە هاتە ناو قسە تا ئەوەی باوکی عود ئەم هۆنراوەی عومەر کوڕی باوکی ڕەبیعەی خوێندەوە:

وعدت هند و ما كانت تعد ليت هندا انجزتنا ما تعد

و استبدت مرة واحدة انما العاجز من لم يستبد

واتاکەی: هندی (دەزگیران) کەژوان دادانێت، ژوانی دانا و خۆزگە ژوانەکەی لەگەڵ ئێمە دەبردەسەر، ئەو جارێك خۆپەسەندی کرد و ناتەوان ئەو کەسەیە خۆپەسەندی ناکات.

هارون وتی: بەڵێ ناتەوان کەسێکە خۆپەسەندی ناکات.

یەحیا لەناو خزمەتکارەکانی هارون خزمەتکارێکی دانابوو کە لەمەبەست و کارەکانی هارون ئاگاداری دەکردەوە. ئەو خزمەتکارە یەحیای لەم گفتوگۆیە ئاگادار کردەوە. یەحیا باوکی عودی بانگ کرد و سی هەزار درهەمی پێدا و لەلایەن خۆیەوە بیست هەزار درهەمی پێ زیاد کرد و ئەوی بۆ لای منداڵەکانی خۆی فەزڵ و جەعفەر نارد و ئەوانیش هەر کام بیست هەزار درهەمیان پێدا. دواتر ڕەشید بۆ لەناو بردنی بەرمەکییەکان هەوڵیدا و ئەوانی گرفتار کرد.

لەم کاتەدا واسق وتی: سوێند بەخوا باوەگەورێی من ڕاستی وت: ناتەوان ئەو کەسەیە خۆپەسەندی نەکات و باسی ناسوپاسی کرد و ئەوەی شیاوی سزادانە، حەفتەیەك تێنەپەڕی کەدەبیرەکانی خۆی بەدبەخت کرد.

لەم ساڵەدا شیری پاسەوان (ناوێکی فارسییە) لەلایەن ئیتاخەوە وەك فەرمانداری یەمەن دەستنیشان کرا و ڕێگەی ئەو سەرزەمینەی گرتەبەر.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ساڵح وەك فەرمانداری مەدینە دەستینشان کرا و محەممەد کوڕی داود ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ حاجییەکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا خەلەف کوڕی هوشامی بەزازی موقری لەمانگی جومادی الاوەل، فەوریە، چاوی لەدنیا بەست.

## ڕووداوەکانیساڵی دووسەد و سی کۆچی ( ٨٤٤ زایینی )

## ڕۆشتنی بوغا بۆ لای دەشت نشینە عەرەبەکانی مەدینە

لەم ساڵەدا واسق، بوغای گەورەی بۆ لای دەشت نشینەکانی مەدینە ڕەوانە کرد کە لەکەنارەکانی ئەو شارە تالانییان دەکرد.

چۆنیەتییەکەی بەمشێوە بوو: منداڵەکانی سولەیم لەکەنارەکانی مەدینە خراپەکارییان کردبووە پیشە و لەبازارەکانی حیجاز هەر کالایەکیان بەو بەهایەی دەیانویست، دەیانکڕی. کاری ئەوان کاتێك پەرەی سەند کەزۆریان بۆ منداڵەکانی کەنانە و باهلە هێنا و زیانیان پێ گەیاندن و چەند کەس لەوانیان کوشت. ئەم پێشهاتە لەمانگی جومادی الاخرەی ساڵی ٢٣٠/ فەوریەی ٨٤٤ زایینی ڕوویدا. محەممەد کوڕی ساڵح فەرمانداری مەدینە، حیماد کوڕی جەریری تەبەری کەپاسەوانی مەدینە بوو لەگەڵ دووسەد سوار، جیاواز لەهێزە خۆبەخشەکان بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. حیماد بەرێکەوت و لەرویسە ڕووبەڕوویان بوویەوە. لەنێوان دوو سوپا شەڕێکی قورس ڕوویدا. ڕەش پێستەکانی مەدینە کە لەناو سوپاکەی حیماددا بوون هەڵاتن بەڵام حیماد و هاوەڵانی و قورەیشییەکان خۆڕاگرییان کرد و درێژەیان بەجەنگدا و سەرئەنجام حیماد و ژمارەیەك لەهاوەڵانی کوژران. منداڵەکانی سولەیم دوای کوشتنی ئەوان ئەسپ و کەرەستەکانی جەنگی ئەوانیان وەك تالانی کۆکردەوە و دواتر چاوی تەماحیان بڕییە گوندەکان و ئاوگیرەکان کەبۆ حاجییەکانیان دروست کردبوو. لەنێوان مەککە و مەدینە ڕێگەی تالان کردنی خەڵك و کاروانییەکانیان گرتەبەر.

واسق، بوغای گەورە، باوکی موسای لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. بوغا لەشەعبانی ئەم ساڵە، ئاوریل گەیشتە مەدینە. بوغا لەسەر یەکێك لەئاوەکانی بەردەلان ڕووبەڕوویان بوویەوە. ئەم بەردەلانە لەولای سوارقیە بوو کە بەگوند و پەناگەی ئەوان هەژمار دەکرا. بوغا نزیکەی پەنجا کەسی لێ کوشتن و بەم ئەندازەیەی ئەسیر کرد و کەسانی دیکە هەڵاتن و بوغا لەسوارقیە مایەوە. داوای

لەدانیشتوانەی ئەو ناوچەیە کرد ملکەچی خۆیان نیشان بدەن. ئەوان دەستە دەستە دەڕۆشتنە لای بوغا. بوغا ئەو کەسانەی بەخراپەکاری ناویان دەرکردبوو لای خۆی هێشتەوە کەژمارەیان دەگەیشتە هەزار و کەسانی دیکەی ئازاد کرد. لەزیقەعدەی، ژوئیەی ٢٣٠ زایینی ئەسیرەکانی بۆ مەدینە ڕەوانە کرد و لەوێ زیندانی کردن. دواتر بەمەبەستی حەج ڕێگەی مەککەی گرتەبەر. کاتێك حەجی کرد، ڕووی کردە زات عێرەق و هەمان بەڵای بەسەر مناڵەکانی هیلال هێنا. ئەوانیش گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. بوغا نزیکەی سێسەد کەسی لێگرتن و کەسانی دیکەی ئازاد کرد و بۆ مەدینە گەڕایەوە و ئەسیرەکانی ڕەوانەی گرتوخانە کرد.

## مەرگی عەبدوللە کوڕی تاهیر

لەرەبیع الاوەل، نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، عەبدوللە کوڕی تاهیر، فەمانڕەوای خوراسان لەنەیشابور مرد. عەبدوللە کوڕی تاهیر لەکاتی مەرگ فەرمانڕەوای خوراسان و فەرمانداری بەغداد و سەرپەرەستی پاسەوانەکانی بەغداد و فەرمانداری سوادی عێراق و ڕەی و تەبەرستان و کرمان بوو. باجی ئەم سەرزەمینانە لەکاتی مەرگی ئەو چل و هەشت هەزار درهەم بوو. ساڵەکانی تەمەنی چل و هەشت ساڵ درێژەی کێشا. تاهیری باوکیشی لەم تەمەندا کۆچی دوایی کرد. واسق فەرمانداری ئەو سەرزەمینانەی بەکوڕی عەبدوللە، تاهیر کوڕی عەبدوللە سپارد.

## کردار و هەڵس و کەوتی عەبدوللە کوڕی تاهیر

کاتێك عەبدوللە وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاریکرا، محەممەد کوڕی حومەیدی تاهیری وەك نوێنەری خۆی کردە فەرمانڕەوای نەیشابور. ئەو بۆخۆی بناغەی کۆشکێکی داڕشت کەدیوارەکەی تا ڕێگەی هاتوچۆی خەڵك درێژ بوویەوەی. کاتێك عەبدوللە ڕۆشتە نەیشابور، خەڵکانی کۆکردەوە و سەبارەت بەکار و کردەوەکانی محەممەد پرسیاری کرد. دەستەیەك لەخەڵکان پێیان وت:

بێدەنگی خەڵکان نیشانەی خراپەکاری ئەوە. عەبدوللە ئەوی لەسەر کار لابردو فەرمانی وێران کردنی دیوارەکەی دەرکرد.

عەبدوللە دەیوت: دەبێت زانست بەکەسی شیاو بدرێت و بەکەسانی دیکەیش چوونکە زانست خۆی بەرزتر لەوەیە بەنەشیاوەکان رازی ببێت.

دەیوت: پڕ کردنی گیرفان و بەدەست هێنانی ناوی چاکە، هیچ کات پێکەوە دەستەبەر ناکرێن.

یەکێك لەهاونشینەکانی ئەو فەزڵ کوڕی محەممەد کوڕی مەنسور بوو. ڕۆژێك عەبدوللە هەمووی ئەوانی بۆ کۆشکەکەی بانگ کرد و فەزڵ درەنگتر لەهەموان هات. عەبدوللە وتی: ئەی فەزڵ، درەنگ هاتیت؟ فەزڵ وتی: سەرقاڵی کاری دەستەیەك لەخەڵکان بووم و دەمویست بڕۆم بۆ گەرماو. عەبدوللە داوای لێکرد بڕواتە گەرماوە تایبەتییەکەی خۆی. کاتێك فەزڵ ڕۆشتە ناو گەرماوەکە، عەبدوللە وەرەقەی داواکاری خەڵکانی لەبوغچەکەی دەرهێنا و بۆ هەرکام فەرمانێکیدا و واژۆی کرد و لەشوێنەکەی خۆی دانایەوە. فەزڵ لەم کارە ئاگادار نەبوویەوە. کاتێك لەگەرماو هاتەدەر، پاشماوەی ڕۆژیان پێکەوە بەسەر برد. بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ئەو کەسانەی داویان پێشکەش کردبوو، کۆبوونەوە و پرسیاری ئەنجامی داواکارییەکەیان دەکرد. فەزڵ داوای لێبوردنی لێکردن. یەك لەوان وتی: دەمەوێت داواکارییەکەم ببینم. فەزڵ داواکارییەکەی دەرهێنا و کاتێك سەیری کرد، دەستنوسی عەبدوللەی بینی و کاتێك سەیری هەموو داوکارییەکانی کرد، دەستنووسی عەبدوللەی بەسەرەوە بینی. ڕووی کردە خەڵکان و وتی: داواکارییەکانتان ببەنەوە و نیازەکانتان هاتۆتەدی، سوپاسی سەرکردەکەی خۆتان بکەن چوونکە فەرمانی ئەوە بێ ئەوەی من بەشداریم تیا کردبێت.

عەبدوللە قسەزان و شاعیر بوو. ئەمە یەکێك لەهۆنراوەکانی ئەوە:

اسم من أهواه اسم حسن     فاذا صحفته فهو حسن
فاذا اسقطت منه فاءه     كان نعتا لهواه المختزن
فاذا اسقطت منه ياءه     صار فيه بعض اسباب الفتن
فاذا اسقطت منه راءه     صار شيئا يعترى عند الوسن

فاذا اسقطت منه طاءه صار منه عيش سكان المدن

فسروا هذا فلن يعرفه غير من يسبح فى بحر الفطن

واتاکەی: ناوی ئەو کەسەی خۆشم دەوێت، جوانە و ئەگەر نوختەی سەر ناوەکەی هەڵگریت، هەر جوانە، ئەگەر ف ی لیٚ لابەریت تایبەمەندی کەسێك کەدڵدادەیی پاشەکەوت کردووە، ئەگەر ی یی لیٚ لابەریت ناوی بەشێك لەئاژاوەکان دەردەکەوێت و ئەگەر ڕ ی لیٚ هەڵگریت دەبێتە ئەوەی لەکاتی خەو لای تۆ دەردەکەوێت و ئەگر تای لیٚ هەڵگریت دەبێتە ئەوەی شارنشینەکان خوازیارن پێی، هەنووکە پەردە لەسەر ئەم وتەیە هەڵگرە چوونکە تەنیا کەسێك دەزانێت کە لەناو دەریاری وشیاریدا مەلە بکات.

(ناوی ئەو کەسە ظریف) کۆیلەکەیەتی کە بەلابردنی ف (ظری) و بەلابردنی ی (ظرف) و بەلابردنی ڕ لەگەڵ دەستکاری کردن (طریف) ((طیف) بەمانای خەون و بەلابردنی ظ (ریف) دەبێتە یەیلاق.

ئەوزیاتر لەهەموو خەڵکان بەخششی لەگەڵ زانست و ئەزمون دەکردە هاوریٚ. هۆنراوەکان بۆ پرسەی ئەو فراوانن. لەجوانترینیان هۆنراوەکەی باوکی غومری تەبەرییە کە بۆ ئەو و مەرگی باوکی هۆنییویەتییەوە:

فأيامك الاعياد صارت مآتما و ساعاتك الصعبات صارت خواشعا

علة اننا لم نعتقدك بطاهر و ان كان خطبا يقلق القلب راتعا

و ما كنت الا الشمس غابت و اطلعت على اثرها بدرا على الناس طالعا

فلولا التقى قلنا تناسختما معا بديعى معان يفضلان البدائعنا

واتاکەی: ڕۆژەکانی تۆ کەهەمووی جەژن بوو و شادی بەپرسە کۆتایی هات و ساتەکانی توڕەیی تۆ (لەکاتی جەنگ و کارەکانی دیکە) هەمووی بۆتە گریان. هەرچەند ئێمە تۆمان لەدەست نەداوە چوونکە تاهیر (منداڵ و جێگرەکەی تۆ) هەیە بەلاچم ئەم پرسەیە لەرزە لەدڵ دروست دەکات. تۆ جگە لەهەتاو نەبوویت کەجێگەکەی بەمانگی شەوی چواردە پڕ کرایەوە و رووناکی خۆی بەسەر خەڵکان بەخشییەوە. تۆ جگە لەکێو نەبوویت کەجێگەکەی گۆڕا و پایەیەکی بۆ بەرگری

کردن بەجێهێشت (تاهیر) ئەگەر خواپەرەستی نەدەبوو، باوەڕمان بەتەناسوخ[١٧] دەهێنا و هەردووی ئێوەمان بەهەڵگری سرشتە جوانەکان و کردەوە چاکەکان دەزانی.

ئەم هۆنراوەیە بەم دێرە کۆتایی نایەت.

هێرشی ناباوەڕان بۆ سەرزەمینەکانی موسوڵمانان لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا مەجوس[١٨] لەدوورترین کەنارەکانی ئاندۆلۆس لەرێگەی دەریاوە هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی موسوڵمانەکان. ئەم هێرشە لەزیجەججەی ساڵی ٢٢٩/ ئوتی ٨٤٣ زایینی و لەئەشبونە (لیسبون) روویدا. سیانزە رۆژ لەنێوان ئەوان و موسوڵمانان چەند پێشهاتێك روویدا. ئەوان دواتر رێگەی قادس و دواتر شەزونە (سیدونیا)یان گرتەبەر. چەندین جەنگ لەنێوان ئەوان و موسوڵمانان بەکار برا.

ناباوەڕان لەهەشتی موحەرەم/ بیست و شەشی سێپتامبەر رێگەی ئەشبیلەیان(سیویلیا) گرتەبەر و لەدوانزە فەرسەخی ئەو شارە ئوردوویان لێدا. ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان هێرشیان کردنەسەر. دوو سوپار رووبەرووی یەك بوونەوە و لەکۆتاییەدا موسوڵمانان لەدوانزەی موحەرەم/ ٣٠ سێپتامبەر شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لیٚ کوژرا. ناباوەڕان گەیشتنە دوو مایلی ئەشبیلییە. خەڵکانی ئەشبیلییە رووبەروویان بوونەوە بەڵام ئەوانیش لەچواردەی موحەرەم، دووی ئۆکتۆبەر شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ئەسیر کران. ناباوەڕان بەزەییان بەچوارپێ و مرۆڤەکاندا نەدەهاتەوە و دەیانکوشتن و سەرئەنجام گەیشتنە ناو شارەکە و شەو و رۆژێك لەویٚ مانەوە و دواتر بۆ لای

---

[١٧] تەناسوخ بەمانای گواستنەوەی رۆحە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە. واتا ئەو کەسەی دەمرێت، رۆحی دەچێتە ناو جەستەی مرۆڤێکی دیکەوە. سەرەتا ئەم باوەڕە لای هیندییەکان دەرکەوت و لەئاییینی بودایسدا گەشتە ترۆپك. (وەرگێر)

[١٨] نوسەر لەجیاتی وشەی ناباوەڕ، مەجوسی بەکار بردووە و بەئەگەری زۆر ناڕاستە چوونکە مەجوس وشەیەکە بۆ زەردەشتییەکانیان بەکار دەبرد لەکاتێکدا ناباوەڕان بەئاییینی ئیسلام لەئاندۆلۆس، ئایینیەکەیان لەگەڵ زەردەشتییەکان جیاواز بوو. (وەرگێر)

کەشتییەکانیان گەڕانەوە.

دواتر رووبەرووی دەستەیەك لەسوپاکەی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس بوونەوە کەژمارەیەکی زۆر لەگەورەکان و فەرماندەکان لەناویاندا بوون. ناباوەڕان هێرشیان کردنەسەر بەلاّم موسوڵمانان خۆڕاگرییان کرد و حەفتا کەسیان لیّ کوشتن و سەرئەنجام ریّگەی هەلاّتنییان گرتەبەر و سوار کەشتییەکانیان بوونەوە. موسوڵمانان دەستیان لەجەنگ هەڵگرت. عەبدولرەحمان ئاگادار بوویەوە و سوپایەکی دیکەی ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە رووبەرووی ناباوەڕان بوونەوە و بەهەلاّتن ناچاریان کردن. سوپاکەی عەبدولرەحمان لەدووی رەبیع الاوەل، حەڤدەی دیّسامبەر شوێنیان کەوتن و جەنگیان دەستپێکرد. موسوڵمانان لەهەموو ناوچەکانەوە هاوکارییان بەدەست دەگەیشت و لەهەموو ناوچەکانەوە هێرشیان دەکردە سەر ناباوەڕان. ناباوەڕان هێزی خۆیان کۆکردەوە و هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکان بەشێوەیەك ئەوەندەی نەمابوو شکستیان پیّ بێنن بەلاّم موسوڵمانان خۆڕاگرییان کرد و ژمارەیەك لەسەرکردەکان دابەزین و بوێرانە ئاگری گۆڕەپانی جەنگیان هەڵگیرساند و ناباوەڕانیان ناچار بەهەلاّتن کرد. نزیکەی پێنسەد کەس لەسوپای ناباوەڕان کوژران و چوار کەشتییان لەلایەن موسوڵمانانەوە دەستی بەسەردا گیرا. موسوڵمانان کەشتییەکانیان تالاّن کرد و دواتر گڕیان تیّ بەردا و چەند رۆژێك لەشوێنەکانی خۆیان مانەوە چوونکە ناباوەڕان لەناو کەشتییەکانیان بوون.

ناباوەڕان شەوێك بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر لەبلە (نیبلا) و ژمارەیەکیان ئەسیر کرد و دواتر روویان کردە دورگەی قوریس و لەنزیك ئەو دورگەیە دابەزین و تالاّنییەکانیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد. لەم کاتەدا موسوڵمانان هاتنە جۆش و لەرووباریاندا و دوان لەناباوەڕانیان کوشت. ناباوەڕان ئەو ناوچەیان بەجێهێشت و ریّگەی شەزونەیان گرتەبەر. لەویّ برێك خواردن و چەند کەسێکیان ئەسیر کرد و دوو رۆژ مانەوە.

لەم رۆژانەدا کەشتییەکانی عەبدولرەحمان گەیشتە ئەشبیلیە و کاتێك ناباوەڕان ئاگادار بوونەوە، خۆیان گەیاندە لەبلە و تالاّن کردنیان کردە پیشە و چەند

کەسێکیان فڕاند و خۆیان گەیاندە ئەکشونیە و لەوێوە ڕێگەی باجەیان (بڕا) گرتەبەر. بەرادەیەك دوور کەوتنەوە کەچیتر هەواڵیان بەدەستی موسوڵمانان نەدەگەیشت و موسوڵمانان ئارام بوونەوە.

دەستەیەك لەمێژوو نووسان ئامارژەیان بەهێرشی ناباوەڕان بۆ سەر ئەشبیلییە لەساڵی ٣٤٦/ ٨٦٠ زایینی داوە کەهاوشێوەی ئەم بەسەرهاتەیە بەلاّم نازانم ئەمەیە یا نا چوونکە لەساڵی ئەم هێرشانەدا ناسازگاری دەبینرێت بەلاّم بەئەگەری زۆر هەر دووکیان یەکێکە و من لێرەدا ئامارژەم پێداوە چوونکە گێڕانەوەکان جیاواز بوون.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سەعد کوڕی مونیع، باوکی عەبدوللە، دەبیری واقدی، نوسەری طبقات و محەممەد کوڕی یەزداد کوڕی سوەیدی مەروزی، دەبیری مەئمون و عەلی کوڕی جوعد باوکی حەسەنی جەوهەری کەساڵەکانی تەمەنی بۆ نەوەد و شەش ساڵ درێژ بوویەوە و لەمامۆستاکانی بوخاری بوو، کۆچی دواییان کرد.

لەم ساڵدا ئەشناسی تورکی (ئێرانی) نۆ ڕۆژ دوای مەرگی عەبدوللە کوڕی تاهیر کۆچی دوایی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەب کەهەڵسوڕاندنی کاروباری حەج بەو سپێردرابوو، بۆ حەج سەفەری کرد و محەممەد کوڕی داود ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و یەکی کۆچی ( ٨٤٥ زایینی )

## هەڵس وکەوتی بوغا لەگەڵ سارانشینەکان

لەم ساڵەدا خەڵکانی مەدینە ئەو ئەسیرانەیان کوشت کەبوغا لەمناڵەکانی سولەیم و هیلال گرتبوونی.

چۆنیەتی ئەم روداوە بەم شێوە بوو: کاتێك بوغا ئەسیرەکانی لەمناڵەکانی سولەیم و مناڵەکانی هیلال --ژمارەیان دەگەیشتە هەزار و سێسەد کەس– لەمەدینە زیندانی کرد، بۆ لای مناڵەکانی موڕە بەرێکەوت. لەم کاتەدا ئەسیرەکان بەمەبەستی هەڵاتن دیواری زیندانەکەیان کون کرد. ژنێك ئەم کونەی بینی و خەڵکانی مەدینەی ئاگادار کردەوە. خەڵکان هاتن و بینیان ئەسیرەکان زیندانوانەکەیان کوشتووە و کەرەستەی شەڕی ئەویان هەڵگرتووە. خەڵکانی مەدینە بڕیاریاندا نەهێڵن لەزیندانەکە بێنەدەر، دەرویان گرتن و شەڕیان لەگەڵ کردن و بۆ ڕۆژی دواتر ئەوانیان کوشتار کرد. ڕەشپێستەکانی مەدینە هەر سارا نشینێك کەبۆ کۆکردنەوەی خواردەمەنی رووی لەمەدینە کردبوو، کوشتیان. کاتێك بوغا گەڕایەوە و لەکوژرانی ئەسیرەکان ئاگادار بوویەوە، پەرێشان بوو.

دەڵێن: زیندانوانەکە بەرتیلی وەرگرتبوو تا دەرگای زیندانەکەیان بۆ بکاتەوە بەڵام ئەوان پەلەیان کرد و پێش کردنەوەی دەرگاکە هەڵاتن و لەکاتی هەڵاتن ئەم هۆنراوەیان دەخوێند:

الموت خير للفتى من العار          قد اخذ البواب الف دينار

واتاکەی: مەرگ بۆ جوامێر لەنەنگ شیاوترە و زیندانوان هەزار دیناری وەك بەرتیل لەئێمە وەرگرتووە.

هۆکاری نەبوونی بوغا لەو کاتەدا ئەوە بوو دوو هۆزی فەزارە و موڕە، دەستیان بەسەر فەدەك دا گرتبوو. کاتێك بوغا لێیان نزیك کەوتەوە، سەرکردەیەکی فەزاری بۆ لای ئەوان نارد بۆ ئەوەی ئەمانیان پێ ببەخشێت و لەهەواڵەکانی ئەوان ئاگاداری بکاتەوە. کاتێك سەرکردەی فەزاری گەیشتە لای ئەوان، لەگەورەیی بوغا ئەوانی ترساند و بەمشێوەیە هەموویان هەڵاتن و دەستیان لەفەدەك هەڵگرت و

ڕێگەی شامیان گرتەبەر.

بوغا لەحەیفا، گوندێك لەدەوروبەری شام و دراوسێی حیجاز مایەوە و چل ڕۆژی لەوێ بەسەر برد. دواتر لەگەڵ ئەسیرەکانی خۆی لەمناڵەکانی موڕە و فەزارە ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەهۆزەکانی غەتەفان، فەزارە، ئەشجەع و سەعلەبە هاتنە لای بوغا. بوغا پێشتر پەیکی بۆ لای ئەوان ناردبوو. کاتێك هاتنە لای بوغا، سوێند و پەیمانی بەهێزی لێ وەرگرتن بۆ ئەوەی هەر کات پێویستی پێیان بوو، ئامادە بن. ئەوان سوێند و پەیمانیان بەست نافەرمانی نەکەن. دواتر بۆ سەرکوت کردنی مناڵەکانی کەلاب ڕێگەی زەریەی گرتەبەر. سێ هەزار کەس لەوان هاتنە لای بوغا و بوغا نزیکەی هەزار کەس لەخراپەکارانی ئەوانی زیندانی کرد و ڕێگەی بۆ کەسانی دیکە کردەوە. ئەو لەڕەمەزانی ٢٣١/ مەی ٨٤٦ زاییینی ئەسیرەکانی هێنایە مەدینە و زیندانی کردن. دواتر بەمەبەستی ئەنجامدانی حەج ڕێگەی مەککەی گرتەبەر و دوای حەج بۆ مەدینە گەڕایەوە.

## بەسەرهاتی ئەحمەد کوڕی نەسر کوڕی مالکی خوزاعی

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەخەڵکانی بەغداد بەسەرکردایەتی ئەحمەد کوڕی نەسر کوڕی مالك کوڕی هەیسەمی خوزاعی شۆڕشیان کرد. باوەگەورێی ئەحمەد، مالك لەگەورەکانی مناڵەکانی عەباس بوو کەپێشتر ئاماژەمان پێداوە.

هۆکاری ئەم شۆڕشە ئەوە بوو ئەحمەد کوڕی نەسر لەحەدیس بێژەکان کەسانێکی وەك کوڕی موعین، کوڕی دەورەقی و باوکی زوهەیری لەدەوری خۆی کۆکردەوە و دژایەتی ئەو کەسانەی کرد کەقورئانیان بەئافرێنراو لەقەڵەم دەدا لەکاتێکدا واسق ژیانی لەبێژەرانی ئەم وتەیە دژوار و تاڵ دەکرد. ئەو بەم شێوەیە ناوی واسقی دەبرد: ئەم بەرازە خوا نەناسە ئەوە دەکات و ئاوا دەڵێت. جوێنەکانی ئەو بەواسق گەیشتەوە. لەناو کەسە نزیکەکانی ئەحمەد یەکێك بەناوی باوکی هارونی شەداخ و یەکی دیکە بەناوی تالب و دەستەیەکی دیکە خەڵکیان بۆ شوێنکەوتنی ئەو هان دەدا. ئەوان بەیعەتیان لەگەڵ ئەحمەد کردبوو فەرمان

بەچاکەکاری و ڕێگە لەخراپەکاری بگرن. پارەیەکی زۆریان لەناو خەڵکدا دابەش کرد. هەرکەس پەیوەستیان بوو یەك دیناری وەرگرت. بەمشێوەیە لەگەڵ خەڵکان کاتێکیان دیاریکرد کەشەوی پێنجشەممە سێی شەعبان/ پێنجی ئاوریل لەگەڵ لێدانی تەپڵ، دژی حکومەت شۆڕش بکەن.

یەك لەو دوانە لەبەشی ڕۆژهەڵات و ئەوی دیکەیان لەبەشی ڕۆژئاوا مایەوە کە لەناکاو دوان لەمناڵەکانی ئەشرەس کەبەیعەتیان لەگەڵ ئەمان بەستبوو، شەوێك پێش کاتی دیاریکراو بادەیان خواردەوە و مەست و سەرخۆش دەستیان بەلێدانی تەپڵ کرد و کەس هیچ کارێکی نەکرد. لەو کاتەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم فەرماندەی پاسەوانەکان لەبەغداد نەبوو و براکەی محەممەد کوڕی ئیبراهیمی لەجێگەی خۆی دانابوو. ئەو کەسێکی نارد تا لێکۆڵینەوە لەم پێشهاتە بکات بەڵام کەس نەبینرا. ئاگاداریان کردەوە کەپیاوێك لەگەرماودایە کەچاوی زیانی پێگەیشتووە و بەعیسای یەکچاو ناوی دەبەن (ئەو ئاگاداری ئەم کارەیە). ئەویان هێنا و پرسیاریان لێکرد و ئەو بەسەرهاتی مناڵەکانی ئەشرەس و ئەحمەد کوڕی نەسر و کەسانی دیکەی بەتەواوی بۆ باس کردن. دەستەیەك لەو کەسانەی ناویان برابوو، گیران کەتالب و باوکی هارون لەناویاندا دەبینران. لەماڵی مناڵەکانی ئەشرەس دوو ئاڵای سەوز دۆزرایەوە. خزمەتکارەکەی ئەحمەد کوڕی نەسریان گرت و ئەویش هەموو شتێکی بێ کەم و کوڕی گێڕایەوە. محەممەد کوڕی ئیبراهیم کەسێکی بەدوای ئەحمەد کوڕی نەسر نارد و نێردراو ئەحمەدی لەگەرماودا گرت و بردییە لای محەممەد. ماڵەکەی گەڕان بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە نیشانەیەك بۆ شۆڕش بێت. محەممەد کوڕی ئیبراهیم ئەوانی قۆڵبەست کراو سوار ئێستری بێ کورتان کرد و ڕەوانەی سامەڕای کردن.

کاتێك واسق لەگەیشتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، بۆ لێکۆڵینەوە لەپرسەکەیان دانیشت و دادگایەکی گشتی سازدا. ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد لەم دادگایە ئامادە بوو. ئەو کوشتنی ئەحمەد کوڕی نەسری پەسەند نەدەکرد. کاتێك ئەحمەد گەیشتە بارەگای واسق، واسق باسی یاخی بوونی ئەوی نەکرد و تەنیا پرسی: سەبارەت بەقورئان دەڵێی چی؟ ئەحمەد وتی: فەرموودەی خواوەندە. ئەحمەد

کوڕی نەسر پێشتر بەلێدانی بۆنی خۆش و تاشینی مووە زیادەکانی جەستە خۆی بۆ مەرگ ئامادە کردبوو. واسق وتی: ئایا قورئان ئافرێنراوە؟. ئەحمەد وتی: فەرموودەی خوایە. واسق وتی: سەبارەت بەخوا دەڵێی چی، ئایا لەرۆژی هەستانەوە دەیبینی؟ ئەحمەد وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەپێغەمبەر (د.خ) دەگێڕنەوە کەفەرمووی: لەرۆژی هەستانەوە خواوەند دەبینن و هاوشێوەی مانگی درەوشاوە دەبێت. واسق وتی: ئێوە سەبارەت بەبینینی خواوەند وەك یەك بیر ناکەنەوە، ئێمەیش فەرموودەی پێغەمبەرمان بیستووە و سوفیان لەحەدیسێکی بڕواپێکراو بۆی گێڕاومەتەوە کەدڵی مرۆڤەکانی خواوەند لەنێوان دوو پەنجە لەپەنجەکانی خواوەندە کەخواوەند ژێر و روویان دەکات و پێغەمبەر (د.خ) بەردەوام بەمشێوەیە دەپاڕایەوە: ئەی ئەو کەسەی دڵ و چاوەکان ئاڵو گۆڕ دەکەیت، خۆڕاگری لەسەر ئەم دینەم پێ ببەخشە.

ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم وتی: بزانە خەلیفە چی دەڵێت: ئەحمەد وتی: تۆ فەرمانت بەمن داوە. ئیسحاق ترسا و پرسی: من فەرمانم بەتۆ داوە؟ ئەحمەد وتی: بەڵێ، فەرمانت بەمن داوە چاکەخوازی ئەو بم و چاکەخوازی من ئەوەیە رێگە نەدەم ناساگاری پێغەمبەر (د.خ) بکات. واسق بەکەسانی دەوروبەری خۆی وت: بۆچوونتان سەبارەت بەو چییە؟ عەبدولرەحمان کوڕی واسق کەقازی بەشی رۆژهەلاتی بەغداد بوو، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەگەورەیی خۆت کوشتنی ئەو ڕەوایە. یەکێك لەهاوەلانی کوڕی باوکی دۆئاد وتی: رێگە بدەن خوێنی ئەو بخۆمەوە. کوڕی باوکی دۆئاد وتی: ئەو ناباوەڕێکە و ئەگەری هەیە پەشیمان ببێتەوە، بەهەمان شێوەی کەئاوزی زیانی پێ گەیشتووە. کوڕی باوکی دۆئاد بەکوشتنی ئەو رازی نەبوو. واسق وتی: ئەگەر بینیتان بۆ لای ئەو دەڕۆم کەس لەشوێنەکەی خۆی نەبزوێت چوونکە هەنگاوەکانم هەڵدەسەنگێنم.

واسق فەرمانیدا سەمسامە، شمشێری عەمرۆ کوڕی مەعدی کەربی زوبەیدی بێنن و دواتر بۆ لای ئەحمەد بەرێکەوت. ئەحمەدیان لەناو ماڵەکە لای داری ئیعدام دانابوو. واسق بەهەمان شمشێر لەملی ئەحمەدی دا و دواتر گورزێکی لەسەری وەشاند. دواتر سیمای دیمەشقی سەری ئەوی لەجەستە جیا کردەوە. واسق

بەنوکی سەمسامە سکی هەڵدڕی. جەستەی بێ گیانی ئەویان بردەی لای جەستەی بابەك و چوارمێخەیان کێشا. سەری ئەحمەدیان ڕەوانەی بەغداد کرد و لەو شارە هەڵیانواسی و پاسەوانیان بۆ دانا. لای سەرەکەی ئەم نووسراوەیان هەڵواسی: ئەمە سەری ناباوەڕی گومڕا ئەحمەد کوڕی نەسرە. هاوەڵانی ئەویان یەك لەدوای یەك گرت و ڕەوانەی گرتوخانەیان کردن.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا واسق مەبەستی حەجی کرد و عومەر کوڕی فەرەجی لەپێشەوە نارد تا ڕێگەی بۆ تەخت بکات. عومەر گەڕایەوە و لەکەمی ئاوی ڕێگە ئاگاداری کردەوە و واسق لەڕۆشتن پەشیمان بوویەوە.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی دینار فەرمانڕەوایەتی یەمەنی گرتەدەست و لەشەعبان/ ئاوریل بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت و لەسەر ڕێگەکەی لەگەڵ چوار هەزار سوار و دوو هەزار پیادە (سوپاکەی) حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا دزەکان تونێلیان لێدا و لەبیت ئەلمال چل و دوو هەزار درهەم و کەمێك دیناریان لەدار ئەلعامە دزی. بەڵام لێکۆڵینەوەیان لەم ڕووداوە کرد و سامانەکانیان گەڕاندەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی خارجی سەعلەبی لەگەڵ سیانزە کەس لەسەرزەمینی ڕەبیعە شۆڕشی کرد. غانم کوڕی باوکی موسلیم کوڕی ئەحمەدی توسی فەرماندەی پادگانی موسڵ ڕووبەڕووی بوویەوە. لەشۆڕشییەکان چوار کەس کوژرا و محەممەد کوڕی عەبدوڵلە دەستگیر کرا. ئەویان بۆ سامەڕا نارد و زیندانی کرا.

لەم ساڵەدا وەسیفی تورك لەکەنارەکانی ئیسفەهان و کێوەکان (زاگرۆس، کرمانشان و لورستان) و فارس گەڕایەوە. ئەو بۆ سەرکوت کردنی کوردەکان ڕۆشتبوو چوونکە کوردەکان بارودۆخی ئەو دیارەیان شێواندبوو. ئەو توانی لەگەڕانەوەدا نزیکەی پێنسەد ئەسیر لەگەڵ خۆی بێنێت کەکۆیلە کەم تەمەنەکان لەناویاندا دەبینران. ئەم دەستەیە زیندانی کران. حەفتا و پێنج هەزار دینار و

شمشێرێکی گەوهەر نیشان وەك خەلاتی پێشکەش بەوەسیف کرا.

لەم ساڵەد سوپایەك لەموسوڵمانان بەرەو سەرزەمینی ناباوەڕان بەرێکەوتن و مەبەستی گرتنی گالیسیایان کرد. کوشتاری خەڵکەکەیان کرد و تالآنییەکانیان کۆکردەوە و خۆیان گەیاندە شاری لیۆن و گەمارۆیان خستە سەر شارەکە و بەقەلاکوتەکان، وێرانیان کرد. خەڵکانی ئەو دیارە تۆقان و دارونەداری خۆیان بەجێهێشت و هەلاتن و موسوڵمانان تا ئەو جێگەی دەیانتوانی تالآنییان کۆکردەوە و ئەوەی مابوویەوە، لەناویان برد بەلآم نەیانتوانی دیواری شارەکە بروخێنن. بەمشێوەیە شارەکەیان بەجێهێشت و درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا چوونکە پانتای ئەم دیوارە حەڤدە زەرع بوو بەلآم چەندین کەلێنی گەورەیان لەدیوارەکەدا دروست کرد.

لەم ساڵەدا ئەسیرە موسوڵمانەکان و رۆمییەکان ئالوگۆڕیان پێکرا. موسوڵمانان لەکەنار رووباری لامس کۆببوونەوە. دووری ئەم رووبارە تا تەرتوس یەك رۆژ رێگە بوو. واسق لەبەغداد و شارەکانی دیکە ئەسیرە رۆمییەکانی کڕییەوە تا لەگەڵ ئەسیرە موسوڵمانەکان بیانگۆڕێتەوە.

واسق، ئەحمەد کوڕی سەعید کوڕی موسلیم کوڕی قوتەیبەی باهلی وەك سنوردار دیاری کرد و سنورەکانی بەو سپارد. هەروەها فەرمانداری شارە نزیکەکان لەسنوری بەو سپارد و فەرمانی پێدا لەکاتی دانی خوێنبایی و گۆڕینەوەی ئەسیرەکان ئامادە بێت. خاقانی خزمەتکاری لەگەڵ ئەودا نارد و فەرمانی بەو دوانەدا هەرکەس لەموسوڵمانان کەباوەڕی بەوە بوو کەقورئان ئافرێنراوی خواوەندە و خواوەند لەرۆژی هەستانەوە نابینرێت، ئازادی بکەن و دینارێکی پێ بدەن و ئەوەی ئەم باوەڕی نەبێت با لای رۆمییەکان ئەسیر بێت.

لەرۆژی عاشورای ساڵی ٢٣١/ حەڤدەی سێپتامبەر موسوڵمانان لەگەڵ ئەسیرە رۆمییەکان لەکەناری رووبارەکە کۆبوونەوە و رۆمییەکانیش لەگەڵ موسوڵمانە ئەسیرەکان هاتن. رووبار ئەم دوو دەستەی لەیەك جیا دەکردەوە. موسوڵمانان ئەسیرێکیان ئازاد دەکرد و رۆمییەکان لەبەرابەردا ئەسیرێکیان ئازاد دەکرد. ئەم دوو ئەسیرە لەناوەراستی رووبارەکە بەیەك دەگەیشتن و هەرکام بۆ لای هاوەلآنی

خۆی دەگەڕایەوە. کاتێك موسوڵمانی ئەسیر دەگەیشتە لای موسوڵمانان، هەمووان دەنگی تەکبیریان بەرز دەکردەوە و کاتێك ڕۆمی دەگەیشتە لای هاوەڵانی، ڕۆمییەکان دەنگیان بەرز دەکردەوە تا ئەوەی هەموو ئەسیرەکان ئاڵوگۆڕ کران. ژمارەی ئەسیرە موسوڵمانەکان چوارهەزار و چوارسەد و شەست کەس و ژمارەی ژن و منداڵەکان هەشسەد کەس و ئەهلی زەممە(ئەوانەی لەپەنای موسوڵماناندا بوون و لەگەڵ ئەوان گەڕانەوە) سەد کەس بوو.

ئەم ڕووبارە قوڵ نەبوو و ئەسیرەکان دەیانتوانی بەئاسانی بیپەڕنەوە. دەستەیەك دەڵێن: لەسەر ڕووبارەکە پردێك هەڵبەسترابوو.

کاتێك ئاڵوگۆڕی ئەسیرەکان کۆتایی پێهات، ئەحمەد کوڕی سەعید کوڕی موسلمی باهلی لەزستان جەنگ و غەزای دەستپێکرد بەلاّم خەڵکان گرفتاری بارین و سەهۆڵبەندان بوون و لەم ناوەدا دووسەد کەس گیانیان لەدەستدا و بەم ژمارەیە ئەسیر کران و ژمارەیەك لەبەدەندون لەئاودا خنکان. واسق لەئەحمەد تووڕە بوو چوونکە پێشتر دەستەیەك خۆیان گەیاندبووە ڕۆم و ئاگاداریان کردبوویەوە بەلاّم ئەو گرنگی پێنەدان چوونکە ژمارەیەك لەسەرکردەکانی سوپاکەی پێیان وتبوو: سوپایەکی حەوت هەزار کەسی مەترسی لەسەر نییە، جەنگ دژی دوژمن دەست پێبکە و هێرش بکە سەر سەرزەمینەکەیان. ئەحمەد ئەو کارەی کرد و نزیکەی هەزار گا و دە هەزار سەر مەڕی وەك تالاّنی دەستکەوت و ئەو سەرزەمینەی بەجێهێشت. واسق ئەوی لەسەر کار لابرد و نەسر کوڕی حەمزەی خوزاعی لەجومادی الاوەل/ ژانویە وەك جێگری ئەو ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی حسەین لەتەبەرستان مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەنێوان ئەحمەد کوڕی ئەغلەب و براکەی محەممەد کوڕی ئەغلەب لەئەفریقییە جەنگ ڕوویدا. ئەحمەد کەدەستەیەك هاورێیەتیان دەکرد هێرشی کردە سەر محەممەد لەکۆشکەکەی. هاوەڵانی محەممەد دەرگای کۆشکەکەیان بەست و لەسەرەتاوە کوشت و کوشتاریان دەستپێکرد بەلاّم دواتر دەستیان لەخوێن ڕۆشتن هەڵگرت و ڕێگەی ئاشتییان گرتەبەر. چیتر لەوەدوا پێگەی ئەحمەد بەرز بوویەوە و دیوانەکانی پێ سپێردرا و محەممەد تەنیا ناوەکەی

لەحکومەتدا مایەوە و ئەحمەد جڵەوی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست. ئەم بارودۆخە تا ساڵی ٨٤٦/٢٣٢ زایینی بەردەوام بوو. دەستەیەك لەئامۆزاکان و موالییەکانی محەممەد پەیمانیان لەگەڵ بەست و ئەو بەپشتیوانی ئەوان جەنگی دژی ئەحمەد دەست پێکرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ئەوی بۆ رۆژهەڵات دوور خستەوە و بەمشێوەیە بارودۆخ لەئەفریقییە بۆ محەممەد سەقامگیر بوو و ئەحمەدی برای لەعێراق مرد. لەم ساڵەدا باوکی عەبدولله محەممەد کوڕی زیاد ناسراو بەکوڕی ئیعرابی لەشەعبان/ ئاوریل لەتەمەنی هەشتا ساڵی مرد.

لەم ساڵەدا دایکی ئەبیها کچی موسا کوڕی جەعفەر و خوشکی عەلی کوڕی رەزا مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا موخارقی گورانیبێژ و باوکی نەسر ئەحمەد کوڕی حاتەم( ئەو کەسەی حەدیسەکانی ئەسمەعی) و عەمرۆ کوڕی باوکی عەمرۆی شەیبانی و محەممەد کوڕی سەعدان، مردن. مەرگی محەممەد کوڕی سەعدان لەمانگی زیحەجە/ژوئیە بوو.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی عەرعەرە، عاسم کوڕی عەلی کوڕی عاسم کوڕی سوهەیبی واستی، محەممەد کوڕی سەلام کوڕی عەبدوڵلەی جومەحی بەسری کەشارەزای مێژوو و بەسەرهاتەکان بوو و عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی عەلی کوڕی موقەدەم کوڕی باوکی بیشری موقەدەمی، باوکی یەعقوب یوسف کوڕی یەحیا بوەیتی فەقیە، هاوڕێی شافیعی، کە لەکاتی گرفتار بوونی خەڵکان لەبەسەرهاتی ئافراندنی قورئان زیندانی کرا و وەڵامێکی روونی نەدایەوە، لەگەڵ هارون کوڕی مەعروف بەغدادی کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و دووی کۆچی ( ٨٤٦ زایینی )

لەم ساڵەدا بوغای گەورە بۆ لای مناڵەکانی نومەیر بەرێکەوت و هێرشی کردە سەریان.

هۆکاری ئەم هێرشە ئەوە بوو عومارە کوڕی بیلال کوڕی جەریری خەتەفی لەهۆنراوەیەکدا وەسفی واسقی کرد. عومارە هاتە بارەگای واسق و هۆنراوەکەی خۆی خوێندەوە و واسق فەرمانیدا سی هەزار درهەمی وەك بەخشش پێ بدەن. ئەو واسقی ئاگادار کردەوە کەمناڵەکانی نومەیر ئاژاوەگێری و خراپەکاری وکارە فیرۆکان ئەنجام دەدەن و لەیەمامە و دەوروبەری خەڵك و کاروانییان تالان دەکەن. واسق نامەی بۆ بوغا نووسی کە لەمەدینەدا بوو و فەرمانی پێدا هێرشیان بکاتەسەر. بوغا بەرەو یەمامە بەرێکەوت و دەستەیەك لەمناڵەکانی نومەیری لەناو گوندێکدا بینی و ڕووبەڕوویان بوویەوە و پەنجا و چەند کەسی لێ کوشتن و چل پیاوی ئەسیر کرد. دواتر درێژەی بەرێگەدا و گەیشتە مەرئەت و کەسی بۆ لای خەڵکەکە نارد تا فەرمانبەری و گوێڕایەڵی خۆیان نیشان بدەن بەلام ئەوان ڕازی نەبوون و ژمارەیەك لەوان بەرەو کوێستانەکانی سەوەد ئەسپیان غاردا. ئەم کوێستانە لەپشتی یەمامە بوو. بوغا دەستەکانی خۆی بۆ هێرش کردنە سەر ئەوان ڕەوانە کرد و توانییان بەو دەستە هەلاتووە بگەنەوە. دواتر لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاکەی – ژمارەیان دەگەیشتە هەزار کەس -- شوێن هەلاتووان کەوت. ئەوانی بینی کەبۆ جەنگ خۆیان ئامادە دەکرد. ژمارەی ئەم دەستەیە سێ هەزار کەس و لەشوێنێك بەناوی ڕەوزەت ئەلئەمان کۆببوونەوە کەیەك مەنزڵ لە ئەزاحەوە دوور بوو. پێشەنگەکانی سوپاکەی بوغایان تێکشکاند و باڵی چەپی سوپاکەی ئەویان ناچار بەپاشەکشێ کرد و سەد وبیست لەسەربازەکانی بوغایان کوشت و حەوتسەد وشتر و سامانی سوپاکەیان تالان کرد تا ئەوەی شەو داهات. بوغا بەردەوام پێشنیاری ملکەچی و گوێڕایەڵی پێدەکردن.

کاتێك خۆر هەلات و ئەوان کەمی ژمارەی سوپای بوغایان بینی، هێزیان

کۆکردەوە. پیادەکانیان لەپێشەوە و چوارپێکانیان لەدواوە بەجێهێشت و هێرشیان کردە سەر بوغا و شکستیان پێهێنا و گەیشتنە ناو ئوردووگاکەی. هاوەڵانی بوغا لەمەرگی خۆیان دڵنیا بوون. پێشتر ( شەوی پێشتر) بوغا دووسەد سواری بەدوای دەستەیەك لەوان ناردبوو و ئەو کاتەی کوژرانی ئەوان نزیك ببوویەوە، ئەو دووسەد سوارە گەڕانەوە و کاتێك مناڵەکانی نومەیر ئەوانیان بینی کە لەپشتەوە هێرشیان دەکەنەسەر، هەڵاتن و پیادەکانیان گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا و سامانەکانیان گەڕاندەوە. تەنیا ژمارەیەکی کەم لەپیادەکان توانیان خۆیان دەرباز بکەن بەڵام سوارەکان رزگاریان بوو.

دەگێڕنەوە کەشوێنکەوتەکانی بوغا تانیمەرۆ شکستیان خوارد و کاتێك مناڵەکانی نومەیر دەستیان بەکۆکردنەوەی تالآنییەکان کرد، هاوەڵانی شکستخواردووی بوغا و بوغا پەیوەستی یەکبوون و شکستیان بەمناڵەکانی نومەیر هێنا و لەنیمەڕۆ تا ئێواریێ هەزار و پێنسەد کەس لەپیادەکانیان کوشت و لەناو گۆڕەپانی جەنگ ئوردوویان لێدا. فەرماندەی سارانشینەکان پەیامیان نارد و داوای ئەمانیان کرد و بوغا ئەمانی پێدان. ئەوان هاتنە لای بوغا و بوغا ئەسیری کردن و لەگەڵ خۆی ئەوانی هێنایە بەسرە. ئەم جەنگە لەجومادی الاخر/ ژانویە روویدا. ئەوسا واجنی ئەشروسی لەگەڵ حەوتسەد جەنگاوەر بۆ هاوکاری بوغا هات. بوغای ئەوی بەشوێن هەڵاتواندا نارد کە تا تەباله لەکەنارەکانی یەمەن ڕۆشت و دواتر گەڕایەوە. بوغا نامەی بۆ ساڵحی فەرمانداری مەدینە نووسی تا هەموو مناڵەکانی فەزارە و مورە و سەعلەبە و کەلاب قۆلبەست و ڕەوانەی بەغدادیان بکات. ساڵح ئەوکارەی کرد و بوغا لەبەسرەوە خۆی گەیاندە بەغداد و هەردووك پێکەوە ڕێگەی سامەرایان گرتەبەر. لەم ناوەدا دەستەیەك هەڵاتن و دەستەیەك مردن یا لەشۆڕشەکاندا گیانیاندا. ژمارەی ئەو کەسانەی زیندوو مانەوە و لەگەڵ ئەو هاتنە ناو سامەرا، زیاتر لەدوو هەزار و دووسەد کەس لەمناڵەکانی نومەیر و کەلاب و مورە و فەزار و سەعلەبە و تەی بوو.

## مەرگی باوکی جەعفەر واسق

لەم ساڵەدا واسق باللە باوکی جەعفەر هارون کوڕی محەممەدی موعتەسەم لەبیست و چواری زیحەججە، سیانزەی ئاگوست مرد. نەخۆشی (استسقا[١٩]) بووە هۆی کۆچی دوای ئەو. بۆ دەرمان ئەویان خستە ناو تەنورێکی گەرمەوە. ئەو بەهۆی ئەم دەرمانەوە ئارام بوویەوە و فەرمانی پێدان بەیانی ئەو رۆژە گەرمی تەنورەکە زیاد بکەن و زیاتر لەکاتی رۆژی یەکەم لەناو تەنورەکەدا دانیشت. تەنورەکە بەرادەیەك گەرم بوو کەتوانای بەرگە گرتنی نەبوو. ئەویان لەناو تەنورەکە هێنایەدەر. ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد و محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زیات و عومەر کوڕی فەرەج لای ئەو بوون کەمرد بەڵام هەستیان بەمەرگی ئەو نەکرد تا ئەوەی لەسەر تەختەکەی کەوتە خوار.

دەگێڕنەوە: ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد لەکاتی مەرگ لای واسق بوو. ئەو بوو چاوەکانی خستە سەر یەك. دەڵێن لەکاتی مەرگ ئەم دوو دێرەی هێنایە سەرزمان:

المَوت فيه جميع الناس مشترك      لاسوقة منهم تبقى و لا ملك

ما ضر اهل قليل فى تفاقرهم      و ليس يغنى عن الاملاك ما ملكوا

واتاکەی: هەموو خەڵك لەمەرگ یەکسانن، نەپیاوێکی عامی دەمێنێتەوە نە پاشایەك. مەرگ نەزیان لەهەژارەکان لەهەژارییان دەدات و نەبەتواناکان لە بەتواناییان بێ نیاز دەکات.

فەرمانیدا فەرشەکان کۆبکەنەوە، دواتر سەری خستە سەر زەوی رووت و وتی: ئەی ئەو کەسەی فەرمانڕەوایەتیت کۆتایی نایێت، بەو کەسەی فەرمانڕەوایەتییەکەی لەناوچوو، بەخششەکانی خۆت ببەخشە.

ئەحمەد کوڕی محەممەدی واسقی دەڵێت: من لەناو ئەو کەسانەدا بووم کەپەرستاری واسقیان دەکرد. من و دەستەیەك لەهاوەڵانی واسق وەستابووین کە لەهۆش چوو. وتمان: باشترە لەچۆنیەتی حاڵی ئەو بەئاگا بین. ڕۆشتمە پێش و کاتێك گەشتمە سەر سەری، چاوەکانی خۆی کردەوە. نزیك بوو زراوم بچێت،

---

[١٩] جۆرە نەخۆشییەکە کە نەخۆش لەتینویەتی رزگاری نابێت. وەرگێڕ

کەمێك هاتمەدواوە بەڵام کالانی شمشێرەکەم لەدەرگاکە گیری کرد و کەوتم. من بریندار نەبووم و تەنیا کالانی شمشێرەکەم شکا. هەستام و لەشوێنەکەی خۆم هەستام. لەم کاتەدا واسق مرد و ئێمە پەیکەری بێ گیانی ئەومان داپۆشی. فەڕاشەکان هاتن و فەرشی ژێر ئەویان هەڵگرت چوونکە بەناوی ئەوان نوسرابوو. (ترسان تالان بکرێت یا ون ببێت). بۆ ڕێزگرتن لەمردووەکە وەستام و دەرگاکەم بەست. لەم کاتەدا دەنگێکم بیست و دەرگاکەم کردەوە. لەناکاو مشکە دەشتییەکانم بینی کە لەباغەکەوە خۆیان گەیاندبووە ژوورەکە و دەستبەجێ یەکێك لەدوو چاوی واسقیان خوارد. بەخۆم وت: هیچ خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە، ئەمە ئەو چاوەیە کاژێرێك پێش ئێستا کرایەوە و من لەترسا کەوتم و شمشێرەکەم شکا و هەنووکە بۆتە خۆراکی ئاژەڵێکی ناتەوان.

دەستەیەك هاتن و مردووەکەیان شۆرد. ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد سەبارەت بەچاوی ئەو پرسیاری کرد و من بەسەرهاتەکەم لەسەرەتا تا کۆتایی بۆ باس کرد. ئەو سەری سوڕما.

دوای مەرگی واسق ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد نوێژی لەسەر جەستەکەی خوێند و بەخاکی سپارد. دەستەیەك وتوویانە متوەکیلی برای نوێژی لەسەر خوێند و لەهارونییە لەسەر ڕێگەی مەککە بەخاك سپێردرا. زادگای ئەو لەسەر ڕێگەی مەککە بوو. دایکی ئەو دایکی منالێ بوو بەناوی قەراتیس. کاتێك نەخۆشییەکەی پەرەی سەند، ئەستێرەناسەکانی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد. یەکێك لەئەستێرەناسەکان حەسەن کوڕی سەهل بوو. ئەوان سەیری ڕۆژی لەدایك بوونی ئەویان کرد و پێیان وت کەلەم ڕۆژەوە پەنجا ساڵ تەمەنی دەبێت. واسق تەنیا دە ڕۆژ دوای قسەکەی ئەوان مرد.

ڕەنگی روخساری سپی بوو، پیاوێکی قۆز و چوارشانە و ئەندام ڕێك بوو، چاوی چەپی هەرچەند بێ عەیب دەهاتە بەرچاو بەڵام سۆمای بینینی نەبوو، پەڵەیەکی سپی لەناوچاوی دەبینرا. فەرمانڕەوای ئەو پێنج ساڵ و نۆمانگ و پێنج ڕۆژ درێژەی کێشا. ئەو سی و دوو ساڵ یا بەوتەیەك سی و شەش ساڵ ژیا.

## کردەوە و هەڵس و کەوتی واسق باللە

کاتێك موعتەسەم مرد و واسق جێگەی گرتەوە، ڕێگەی چاکەکاری لەگەڵ خەڵکان گرتەبەر. عەلەوییەکانی پاراست، ڕێزی لێگرتن و چاکەی لەگەڵ کردن و سامانێکی زۆری پێ بەخشین. بەرادەیەك پارەی بەخەڵکانی مەککە و مەدینەدا کە لەرۆژگاری ئەو یەك سواڵکەر لەو دوو شارەدا نەبینرا.

کاتێك واسق مرد، هەمان شەو ژنانی مەدینە روویان لەگۆڕستانی بەقیع کرد و شین و ڕۆڕۆیان بۆ کرد. ئەوان لەخەمی لەدەستدانی واسق بەنۆرە پرسەیان بۆ گێڕا. ئەمە لەبەر ئەوە بوو چاکەی لەگەڵ ئەوان کردبوو و لەرۆژگاری خەلافەتی خۆی ماڵیاتی دەیەکی کەشتییەکانی لێ وەرنەگرتن کەپارەیەکی فراوان بوو.

حسەین کوڕی زوحاك دەڵێت: چەند رۆژ دوای مەرگی موعتەسەم واسقم بینی. یەکەم جار بوو سفرەیەکی بەزمی راخستبوو. کەنیزی ئیبراهیم کوڕی مەهدی ئەمەی خوێند:

مادری الحاملون یوم استقلوا    نعشه للثواء ام للبقاء

فلیقل فیك باکیاتك ماشــــــ    ن صباحا و عند کل مساء

واتاکەی: ئەوانەی پەیکەری بێ گیانی ئەویان (موعتەسەم) هەڵگرت نەیاندەزانی ئەو بەرەو بوون دەبەن یا نەبوون، ئەو ژنانەی بۆ تۆ دەگرین لەهەر بەیانی و ئێوارییەك هەرچی دەخوازن بڵێن (چوونکە تۆ لەپێشتر لەقسەکانی ئەوانیت).

لەم کاتەدا واسق گریا و ئێمەیش لەگەڵ ئەو گریایین تا ئەو جێگەی گریان ئێمەی لەخۆشییەکان دوور خستەوە. بێژەر دەڵێت: یەکێك لەوان وتی:

ودع هریرة ان الرکب مرتحل    و هل تطیق و داعا ایها الرجل

واتاکەی: هورەیرە پشتگوێ بخە چوونکە کاروان بەرێکەوتووە، ئەی پیاو ئایا توانای ماڵئاوایی کردنت هەیە.

گریانی واسق زیاتر و وتی: تا ئەمرۆ پرسەیەکی لەو شێوەم بۆ هیچ کەس نەبینیوە. نەفس (یەکێك لەگۆرانیبێژەکان) هۆنراوەیەکی خوێند و دواتر هەرکەس بۆ لای کارەکانی خۆی گەڕایەوە.

بێژەر دەڵێت: ئەحمەد کوڕی عەبدوەهاب لەوەسفی واسق ئەم هۆنراوەی

هۆنییەوە:

ابت دارالاحبة ان تبينا  اجدك ما رأيت لها معينا

تقطع حسرة من حب ليلى  نفوس ما اثبن و لا جزينا

واتاکەی: ماڵ و جێگەی هاورێیان بەدووری رازی نەبوون، سوێندت دەدەم بەراستی ئایا لەو ماڵەدا هاورێیەکت نەبینی؟ گیانی ئێمە بۆ داخ و شەیدایی لەیلی لەت لەت دەبێت بێ ئەوەی هیچ کرێ و پاداشتێك ببێتە بەشی ئێمە.

عەلەم کەنیزی سالح کوڕی عەبد وەهاب بۆ ئەم هۆنراوەیە ئاوازێکی دانا و بەزەرزەریدا و بۆ واسقی خوێندەوە. واسق لێی پرسی: ئەم ئاوازە لەکێیە؟ وتی: لەعەلەم. واسق، سالحی بانگ کرد و داوای فرۆشتنی ئەم کەنیزەی لێکرد. سالح کەنیزەکەی پێشکەش بەواسق کرد و واسق فەرمانیدا پێنج هەزار دینار بەسالح بدەن. کوڕی زیات لەدانی ئەم پارەیە کەمتەرخەمی کرد. کەنیز جارێکی دیکە گۆرانی خوێند و واسق پێی وت: ئافەرین بۆ تۆ و بۆ ئەو کەسەی تۆی پەروەردە کردووە. کەنیز وتی: ئەو کەسەی منی پەروەردە کردووە، چ سوودێکی پێ دەگات؟ فەرمانت دا پارەی پێ بدەن بەڵام تا ئێستا هیچی بەدەست نەگەیشتووە. واسق نامەیەکی بۆ کوڕی زیات نووسی و فەرمانی دانی پارەکەی پێدا. واسق بڕی پارەکەی دوو بەرابەر کرد و کوڕی زیات دە هەزاری بەسالح دا. سالح لەکاروباری دیوان خۆی بەدوور گرت و سەرقاڵی بازرگانی بوو.

باوکی عوسمانی مازنی نەحوی دەڵێت: واسق منی لەبەسرەوە بانگ کرد. کاتێك ڕۆشتمە لای، وتی: چ کەسێك لەبنەماڵەکەت لەبەسرە ماوەتەوە؟ وتم: کچەکەم. وتی: کچەکەت لەکاتی هاتنی تۆ وتی چی؟ وتم: ئەوەی کچی ئەعشا وتی:

تقول ابنتي حين جد الرحيل  ارانا سواء و من قد يتم

فيا ابتا لا تزل عندنا  فانا نخاف بأن تخترم

ارانا اذا اضمرتك البلا  د نجفى و تقطع منا الرحم

واتاکەی: کچەکەم لەکاتی بڕیاری من بۆ سەفەر وتی: من خۆم لەگەڵ هەتیوێك وەك یەك دەبینم. ئەی باوکە، بەردەوام لەگەڵ ئێمەبە چوونکە لەمەرگی تۆ دەترسین. خۆم دەبینم کەهەرکات کەنارەکان تۆ لەخۆ بگرن و بتشارنەوە، ستەممان لێکراوە و

خزمایەتی ئێمە پچڕاوە.

واسق وتی: تۆ چ وەڵامێکت دایەوە؟ باوکی عوسمان وتی: ئەوەی جەریر وەڵامی کچەکەی دایەوە:

ثقي بالله ليس له شريك و من عند الخليفة بالنجاح

واتاکەی: خواوەند بەبڕواپێکراو بزانە چوونکە کەس شەریکی نییە و جگە لەرزگاری لەلایەن خەلیفەوە نەبێت. واسق پێکەنی و فەرمانیدا پاداشێکی بەرچاوی پێبدەن.

## جێگری متوەکیل

لەم ساڵەدا دوای مەرگی واسق بەیعەتیان لەگەڵ متوەکیل عەلی باللە جەعفەر کوڕی موعتەس بەست.

کاتێك واسق مرد، ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد و ئیتاخ و وەسیف و عومەر کوڕی فەرەج و کوڕی زیات و باوکی وەزیر ئەحمەد کوڕی خالید خۆیان گەیاندە کۆشکی خەلیفە و مەبەستی ئەوەیان کرد بەیعەت لەگەڵ محەممەد کوڕی واسقی مێردمنداڵ بکەن. عابایەکی ڕەش (دروشمی مناڵەکانی عەباسیان) لەبەر کرد و کلاوێکیان خستەسەر بەڵام لەبەر ئەوەی کورتە باڵا بوو، وەسیف نەیتوانی خۆی بگرێت و وتی: ئایا لەخوا ناترسن؟ جل و بەرگی خەلافەت دەکەنە بەر منداڵێك؟ دانیشن و سەبارەت بەجێگری واسق راوێژ بکەن. ئەوان ناوی چەند کەسیان برد و سەرئەنجام متوەکلیان هەڵبژارد. کاتێك متوەکیل هات ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد جل و بەرگی لەبەر کرد و عەمامەی کردە سەر و نێوان دوو چاوی ئەوی ماچ کرد و وتی: سلاو لەتۆ ئەی سەروەری باوەڕداران و بەخشش و پاداشتی خوایی بۆ تۆ. ئەوسا واسقیان شۆرد و نوێژیان لەسەر خوێند و بەخاکیان سپارد.

لەرۆژی بەیعەت بیست و شەش ساڵ لەژیانی متوەکیل تێدەپەڕی. ئەو مانگانەی هەشت مانگی سوپاکەیدا. کوڕی زیات دەیویست نازناوی مونەتسری پێبدات بەڵام ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد وتی: بیرم لەنازناوێك کردۆتەوە کەگومان دەکەم بۆ ئەو گونجاو بێت و ئەو نازناوە (متوەکیل عەلی اللە یە) فەرمانیدا و ئەم نازناوەیان

پەسەند کرد و ئەم فەرمانەی بۆ هەموو سەرزەمینە ئیسلامییەکان نارد.

دەڵێن: متوەکیل پێش ئەوەی ببێتە خەلیفە لەخەودا بینیبووی لەئاسمانەوە شەکری سلێمانی بەسەردا دەپرژێنن کە لەسەری نوسرابوو متوەکیل عەلی الله. ئەم خەوەی بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە. وتیان: سوێند بەخوا ئەمە خەلافەتە. واسق لەمە ئاگادار بوویەوە و متوەکیلی گرت و بارودۆخی لێ دژوار کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا حاجییەکان لەکاتی گەڕانەوە لەماڵی خوا گرفتاری کەم ئاوی بوون بەشێوەیەك کەمێك ئاو بەچەند دینارێك دەفرۆشرا و ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەتینویەتی گیانیاندا.

لەم ساڵەدا موسا لەئاندۆلۆس ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و دژی عەبدولرەحمان فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس شۆڕشی کرد. ئەو پێشتر گوێڕایەڵی فەرمانەکان بوو. عەبدولرەحمان سوپایەکی بەفەرماندەیی محەممەدی کوڕی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەئاندۆلۆس وشکەساڵی ماڵوێرانکەر دەرکەوت. ئەم وشکەساڵییە لەساڵی ٨٤٦/٢٣٢ زایینی دەستی پێکرد و بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان و چوارپێکان مردن و دارەکان وشکیان کرد و هیچ جوتیارێك توانای وەرزێری نەبوو. لەم ساڵەدا خەڵك بۆ بارینی باران نوێژە بارانەیان خوێند و دواتر توانیان کێڵگەکان بکێڵن و بەمشێوەیە وشکەساڵی نەما.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی موسعەب فەمانڕەوایەتی فارسی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا ئاو، ژمارەیەکی زۆر لەشارەکانی موسڵی گرتەوە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن کەگومان دەکرێت نزیکەی سەد هەزار کەس بووبێتن. چۆنیەتییەکەی بەمشێوە بوو کە لەم سەرزەمینە بارانێك باری کەپێشتر هاوشێوەی نەبینرابوو. خوڕی ئەم بارانە بەرادەیەك بوو ئەگەر سەتڵێکیان بەیەك گەز قووڵی و

یەك گەز پانایی لەژێر باران دادەنا لەماوەی كاژێرێك سێ جار پڕ دەبوو. ئاوی دیجلە بەرادەیەك زیادی كرد كە (رەبزی خواروو) كەوتە ژێر ئاو و ئاو، كەناری رووباری (سوق الاربعای) گرت و ژمارەیەكی زۆر لەبازارەكان كەوتنە ژێر ئاو. دەڵێن فەرمانداری موسڵ، غانەم كوڕی حومەیدی توسی سێ هەزار كەسی كفن كرد و بەخاكی سپاردن و ژمارەیەكی زۆریش لەژێر وێرانییەكاندا مانەوە. تەنیا توانییان جەستەی ئەو كەسانە بدۆزنەوە كەئاو لەگەڵ خۆی دەیبردن.

لەم ساڵەدا واسق فەرمانیدا ماڵیاتی دە یەكی كەشتییەكان وەرنەگرن.

لەم ساڵەدا حەكەم كوڕی موسا و محەممەد كوڕی عامری قورەیشی نوسەری كتێبی (صوایف) و چەندین كتێبی دیكە و یەحیا كوڕی یەحیای غەسانی دیمەشقی (كەدەستەیەك دەڵێن لەساڵی ٨٤٧/٢٣٣ زایینی مردووە) و باوكی حەسەن عەلی كوڕی موغەیرەی ئەسەرەمی نەحوی كەزانستی خۆی لەباوكی عوبەیدە و ئەسمەعی فێر ببوو لەگەڵ عەمرۆی ناقد، كۆچی دواییان كرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و سێی کۆچی( ٨٤٧ زایینی )

## دەستگیر کردنی محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زیات

لەم ساڵەدا متوەکیل، محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زیاتی دەستگیر کرد و لەحەوتی سەفەر/ بیست و سێی دیسامبەر زیندانی کرد.

چۆنیەتییەکەی بەمشێوە بوو: واسق، محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی وەك وەزیر دەستنیشان و کاروبارەکانی بەوسپاردبوو. واسق لەم کاتەدا ڕقی جەعفەری متوەکیلی برای لەدڵ گرت و زیندانی کرد و کەسێکی راسپارد تا گوێ لەوتەکانی بگرێت و ئاگاداری بکاتەوە. متوەکیل هاتە لای محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك و داوای لێکرد مۆڵەتی بدات تا لەگەڵ واسق قسە بکات و دڵی بەدەست بێنێت بەڵام محەممەد بێدەنگ بوو و دوای ماوەیەك متوەکیل مۆڵەتی پێدا و کاتێك لەنوسین تەواو بوو، هاوشێوەی کەسێك کەئاگاداری دەدات، سەری بەرز کردەوە و بەمتوەکیلی وت: چ شتێك تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟ متوەکیل وتی: هاتووم تا داوا لەسەروەری باوەڕداران بکەیت، لەمن رازی بێت. محەممەد بەکەسانی دەوروبەری وت: سەیری بکەن، خۆی براکەی ڕەنجاندووە و هەنووکە دەخوازێت کارێك بکەم سەروەری باوەڕداران لێی رازی بێت، درێژە بەرێگەی خۆت بدە، هەرکات کردەوەکانت گۆڕی، ئەویش لەتۆ رازی دەبێت.

متوەکیل خەمبار هەستا و ڕۆشتە لای ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد، ئەحمەد لەبەردەمی وەستا و تا نزیك دەرگا بەرێی کرد و وتی: قوربانی تۆبم، نیازی تۆ چییە؟ متوەکیل وتی: هاتووم تا سەروەری باوەڕداران لەمن رازی بکەیت. ئەحمەد وتی: بەسەر چاو فەرمانەکانت جێبەجێ دەکەم و بۆ ئەم کارە شانازی بەخۆمەوە دەکەم. ئەحمەد لەگەڵ واسق قسەی کرد، واسق بەڵێنی پێدا بەڵام ڕەزامەندی خۆی نیشان نەدا. ئەحمەد جارێکی دیکە قسەی لەگەڵ کرد و ئەم جارە واسق رازی بوو و متوەکیلی بانگ کرد و خەڵاتی کرد.

کاتێك متوەکیل لای کوڕی زیات هاتەدەر، زیات نامەی بۆ واسق نووسی: کەسێك کەجل و بەرگی سواڵکەرەکانی لەبەردا و قژی پەرێشان بوو هاتە لای من و

داوای کرد ڕەزامەندی سەرووەری باوەڕدارانی بۆ بەدەست بێنم. واسق وەڵامی دایەوە: کەسێك بەدوایدا بنێرە و بیهێنە بارەگای من و فەرمان بدە مووی ناوچاوی بتاشن.

متوەکیل دەڵێت: کاتێك نێردراوی محەممەد هاتە لای من، جلێکی ڕەشی تازەم لەبەر کرد و بەهیوای ئەوەی واسق لەمن رازی بووە، ڕۆشتمە لای محەممەد. ئەو کەسێکی بانگ کرد و سەری منی تاشی و مووەکانی کردە سەر جل و بەرگە تازەکەم و هاوشێوەی قامچی مووی بەروخسارمدا شۆڕ کردەوە.

کاتێك متوەکیل لەسەر تەختی واسق دانیشت، تامانگی سەفەری چاوەڕوانی کرد و دواتر فەرمانی بەئیتاخدا کوڕی زیات دەستگیر و ئەشکەنجەی بکات. کاتێك کوڕی زیاتیان بانگ کرد، بەگومانی ئەوەی خەلیفە مۆڵەتی بینینی پێداوە، سوار ئەسپەکەی خۆی بوو بەڵام کاتێك گەیشتە بەردەم کۆشکەکەی ئیتاخ، ئیتاخ جڵەوی ئەسپەکەی سوڕاند. کوڕی زیات ترسا. ئیتاخی ئەوی بردە ناو ژورێك و چەند کەسێکی وەك پاسەوان بۆ دانا و کەسانێکی ڕەوانە کرد تا هێرش بکەنە سەر ماڵ و کۆشکەکانی و دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرن و زەوی و کێڵگەکانی ئەو زەوت بکەن.

کوڕی زیات بی ئۆقرە دەستی بەگریان کرد و لەدەریای ئەندێشەدا ڕۆچوو. ئیتاخ فەرمانیدا ڕێگە نەدەن بخەوێت و هەرکات خەو زۆری بۆ دەهێنا، دەرزییان لەقاچی دەچەقاند بۆ ئەوەی خەوەکەی بزڕێت. دواتر شەو و ڕۆژێك پشتگوێیان خست تا بخەوێت. دواتر خستیانە ناو تەنورێك کەدروست کراوی کوڕی زیات خۆی بوو و بەو تەنورە ئەشکەنجەی ئیسماتی میسری دەدا تا دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت. ئەم تەنورە لەدار دروست کرابوو و بەبزمار دەوری گیرابوو بەشێوەیەك کاتێك کەسێکیان دەکردە ناوی جووڵەی لێدەبڕا چوونکە بزمارەکان لەجەستەی دەچەقین. دەمی تەنورەکە بەئەندازەیەك تەسك بوو کەمرۆڤ دەبوا دوو دەستی بخاتە سەر سەری خۆی بۆ ئەوەی بتوانێت بچێتە ناو تەنورەکە. هەرکەس دەخرایە ناو تەنورەکە توانای دانیشتنی نەبوو و دوای چەند ڕۆژ لەو حاڵەدا دەمرد.

گرتنی ئەو لەحەوتی سەفەر/بیست و سێی سێپتامبەر و مەرگی ئەو لەنۆزدەی رەبیع الاوەل/ چواری نۆڤەمبەر بوو. گێڕانەوەکان سەبارەت بەمەرگی ئەو جیاوازن. دەستەیەك بەو شێوەیان گێڕاوەتەوە کەباسمان کرد و دەستەیەك دەڵێن بەرادەیەك ئەشکەنجەیان کرد تا گیانی سپارد. دەستەیەکیش دەڵێن بێ لێدان وئەشکەنجە کردن مرد.

کاتێك کوڕی زیات مرد، دوو کوڕەکەی سلێمان و عوبەیداللەیان هێنا (هەردووکیان زیندانی بوون). جەستەی بێ گیانی باوکیان بەهەمان جل و بەرگەوە فرێدایە بەردەم دەرگای زیندانەکە. دوو کوڕەکەی وتیان: سپاس بۆ خواوەند کەخەڵکان لەم خراپەکارە رزگارییان بوو. دواتر هەردووك جەنازەکەیان شۆرد و بەخاکیان سپارد. دەڵێن: سەگەکان گۆڕی ئەویان هەڵدایەوە و گۆشتی جەستەیان خوارد.

پێش مەرگ دەنگی دەبیسترا کە بەخۆی دەوت: ئەی محەممەد! ئەم هەموو سامانە، چوارپێ، کۆشکی پاك و خاوێن و جل و بەرگی گرانبایی تۆی رازی و رەزامەند نەکرد تا ئەو کاتەی وەزارەتت گرتەدەست، ئێستا بچێژە ئەوەی بەدوایدا دەگەڕاییت و چیتر بێدەنگ بوو. ئەو جگە لەشایەتوومان و ئامانژەدان بەناوی خواوەند هیچی نەهێنایە سەرزمان.

کوڕی زیات هاوڕێی ئیبراهیمی سولی بوو بەڵام کاتێك وەزارەتی گرتەدەست، هەزار هەزار و پێنسەد هەزار درهەمی لێسەند. سولی ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| و کنت اخی برخاء الزمان | فلما نبا صرت حربا عوانا |
| و کنت اذم الیك الزمان | فاصبحت منك اذم الزمانا |
| و کنت اعدك للنائبات | فها انا اطلب منك الامانا |
| اصبحت من رای ابی جعفر | فی هیئة تنذر بالصیم |
| من غیر ما ذنب و لکنها | عداوة الزندیق للمسلم |

واتاکەی: لەکاتی خۆشیدا برام بوویت بەڵام کاتێك رۆژگاری تەنگی پێ هەڵچنیم تۆیش هاوکاریت کرد، بەردەوام لەرۆژگاری لای تۆ خراپەم دەوت و هەنووکە بۆ ستەمی تۆ سەرکۆنەی رۆژگار دەکەم. من تۆم بۆ سەختییەکان هەڵگرتبوو و

هەنووکە داوای ئەمان لەتۆ دەکەم. من بەهۆی کردەوە و هەڵس و کەوتی باوکی جەعفەر(زیات) لەحاڵێکدام کەمن لەڕوودانی کارەساتێك دەترسێنێت. هیچ گوناحێك لەئارادا نییە مەگەر دوژمنایەتی زەندیق (کوڕی زیات) لەگەڵ موسوڵمانان.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی فەرەجی روخەجی زیندانی کرا. چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو کاتێك متوەکیل لەکاتی نارەزامەندی براکەی ڕۆشتە لای واسق تا پسولەی مانگانەی ئەو واژۆ بکات، عومەر ئەوی بێ هیوار کرد و پسولەکەی فرێدایە ناو حەوشی مزگەوتەکە.

عومەریان لەمانگی رەمەزان، ئاوریل زیندانی کرد ودەستیان بەسەر سامانی ماڵەکەیدا گرت و هاوەڵانیشان گرفتار کرد. دواتر بەپێدانی هەزار هەزار درهەم و رادەست کردنەوەی زەوییەکانی ئەهواز لێی خۆش بوون. ئەو لەزیندان جل وبەرگی پەشمینی لەبەردا بوو. عەلی کوڕی جەهم بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

جمعت امرين ضاع الحزم بينهما تيه الملوك و افعال الصعاليك

اردت شكرا بلابر و مرزئة لقد سلكت سبيلا غير مسلوك

واتاکەی: دوو شتێکی نارێکت بەخۆتەوە بەست و ئەوانت پێکەوە کۆکردەوە: خۆپەسەندی پاشاکان و کردەوەی خراپەکاران. تۆ دەتویست سپاسی تۆ بکەن بێ هیچ چاکەکارییەك و لەم چاوەڕانییەدا ڕێگەیەکت بڕی کەشیاو نەبوو.

لەم ساڵەدا متوەکیل، لەسلێمان کوڕی ئیبراهیم جونەیدی نەسرانی، دەبیری سەمانە، توڕە بوو، ئەشکەنجەی کرد و دواتر سامانەکانی زەوت کرد. هەروەها ڕقی باوکی وەزیری گرتەدڵەوە و سامانی ئەو و براکەیشی گرت.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی مەروان لەدیوانی خەراج دەرکرا و یەحیا کوڕی خاقانی خوراسانی موالی ئەزد جێگەی گرتەوە و ئیبراهیم کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی سولی وەك سەرپەرەستی دیوانی نەفەقەکان دیاریکرد.

لەرەمەزان/ ئاوریلی ئەم ساڵە، متوەکیل، مونتەسیری کوڕی وەك فەرمانداری حەرەمەین و یەمەن و تاییف دەستنیشان کرد.

هەروەها لەجومادی الاخرە/ ژانویەی ئەم ساڵە، ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد ئیفلیج بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا میخائیل کوڕی تۆفیل لەبەرابەر دایکی (شاژنی رۆم) قووت بوویەوە و ناچاری کرد پشت بکاتە دنیا و لەخانەقایەك نیشتەجێ ببێت. هەروەها منالی سەرەرێگەی ئەویشی کوشت چوونکە گومانی لەدایکی دەکرد. دایکی بۆ ماوەی شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

محەممەد کوڕی داود لەم ساڵەدا رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەغلەب پاشای ئەفریقییە کارگوزارەکەی خۆی لەزاب بەناوی سالم کوڕی غەلبونی لەسەر کار لابرد. ئەو بەرەو قیروان بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە قەلای یەلبسیر، رێگەی ناسازگاری گرتەبەر و رێگەی ئەربسی گرتەبەر بەڵام خەڵکی ئەو شارە رێگەی چوونە ناو شاریان لێگرت. سالم ئەوسا رێگەی باجەی گرتەبەر و رۆشتە ناو شارەکە و ئوردوی لێدا. کوڕی ئەغلەب سوپایەکی بەفەرماندەیی خەفاجە کوڕی سوفیان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو رەوانە کرد. خەفاجە رووبەرووی سالم بوویەوە و جەنگی دەستپێکرد. سالم شەوانە هەلات و خەفاجە شوێنی کەوت و گرتی و کوشتی و سەری ئەوی بۆ لای کوڕی ئەغلەب نارد. لەم کاتەدا کوڕی ئەغلەب کوڕی سالمی بەناوی ئەزهەر کوشت کەوەك بارمتە لای ئەو دانرا بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی موعینی بەغدادی لەمەدینە کە لەساڵی ١٥٨/٧٧٤ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا بوو و نووسەری کتێبی (جرح و تعدیل)ە مرد، هەروەها محەممەد کوڕی سەماعەی قازی، هاوڕێی محەممەد کوڕی حەسەن مرد کەساڵەکانی تەمەنی لەسەد تێپەڕی کرد بێ ئەوەی هەستەوەرەکانی زیانیان پێگەیشتبێت.

## ڕووداوه‌كانی ساڵی دووسه‌د وسی و چواری كۆچی ( ٨٤٨ زایینی )

## چۆنیه‌تی هه‌ڵاتنی محه‌ممه‌د كوڕی بوعه‌یس

له‌م ساڵه‌دا محه‌ممه‌د كوڕی بوعه‌یس كوڕی جه‌لیس هه‌ڵات. هۆكاری هه‌ڵاتنه‌كه‌ی ئه‌وه بوو ئه‌ویان قۆڵبه‌ست كراو له‌ئازه‌ربایه‌جانه‌وه بۆ سامه‌را برد. پیاوێك به‌ناوی خه‌لیفه خزمه‌تی ئه‌وی ده‌كرد. له‌و كاته‌دا متوه‌كیل نه‌خۆش بوو. خه‌لیفه به‌كوڕی بوعه‌یسی وت كه‌متوه‌كیل مردووه له‌كاتێكدا ته‌نیا له‌نه‌خۆشییه‌كه‌ی ڕه‌نجی ده‌برد. مه‌به‌ستی خه‌لیفه له‌م كاره ئه‌وه بوو كوڕی بوعه‌یس بۆ هه‌ڵاتن ناچار بكات و بڕیاری هه‌ڵاتنی له‌گه‌ڵ دانا و چوارپێیه‌كی بۆ ئاماده كرد. ئه‌م دوانه بۆ شوێنه‌كه‌ی كوڕی بوعه‌یس له‌ئازه‌ربایه‌جان هه‌ڵاتن. سنووری كوڕی بوعه‌یس به‌مه‌ره‌ند ناو ده‌برا. ده‌ڵێن: قه‌ڵای شایی و قه‌ڵای یه‌ك ده‌رگا تایبه‌ت بوو به‌كوڕی بوعه‌یس.

ده‌سته‌یه‌ك وتوویانه: كوڕی بوعه‌یس زیندانی ئیسحاق كوڕی ئیبراهیم كوڕی موسعه‌ب بوو و بوغای شه‌رابی نێوه‌نجیگه‌ری بۆ كرد و ئیسحاق بۆ ئازادی ئه‌و نزیكه‌ی سی كه‌سی وه‌ك ده‌سته‌به‌ر دیاری كرد كه‌محه‌ممه‌د كوڕی خالید كوڕی یه‌زید كوڕی مه‌زیدی شه‌یبانی له‌ناویاندا ده‌بینرا. كوڕی بوعه‌یس هاتوچۆی بۆ سامه‌را ده‌كرد تا ئه‌وه‌ی بۆ مه‌ره‌ند هه‌ڵات و له‌وێ خوارده‌مه‌نی زۆری پاشه‌كه‌وت كرد. مه‌رند شارێكی داخرا و چه‌ندین باخ و سه‌رچاوه‌ی خۆشی تیا ده‌بینرا. شۆڕشییه‌كانی وه‌ك هۆزی ره‌بیعه و كه‌سانی دیكه په‌یوه‌ستی بوون و به‌مشێوه‌یه ژماره‌ی شمشێر وه‌شێنه‌كانی بۆ هه‌زار دووسه‌د كه‌س به‌رز بوویه‌وه. له‌و رۆژگاره‌دا فه‌رمانداری ئازه‌ربایه‌جان محه‌ممه‌د كوڕی حاته‌م كوڕی هه‌رسیمه بوو و له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بۆ شوێنكه‌وتنی كوڕی بوعه‌یس كه‌مته‌رخه‌می له‌خۆی نیشاندا، متوه‌كیل ئه‌وی له‌سه‌ر كار لابرد و حه‌مدویه كوڕی عه‌لی كوڕی فه‌زڵی سه‌عدی وه‌ك فه‌رمانڕه‌وای ئازه‌ربایه‌جان ده‌ستنیشان و له‌گه‌ڵ ئه‌سپه‌كانی به‌رید ڕه‌وانه‌ی كرد. ئه‌و سوپایه‌كی كۆكرده‌وه و شوێن كوڕی بوعه‌یس كه‌وت و له‌مه‌ره‌ند گه‌مارۆی خسته‌سه‌ر به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ماوه‌ی گه‌مارۆكه درێژه‌ی كێشا، متوه‌كیل زیره‌كی

توركی لەگەڵ دووسەد شاسواری تورك بۆ هاوكاری ئەو ڕەوانە كرد بەڵام ئەویش هیچی پێ نەكرا و بەمشێوەیە متوەكیل، عومەر كوڕی سەیسیل كوڕی كالی لەگەڵ نۆسەد سوار بۆ هاوكاری حەمدویە ڕەوانە كرد بەڵام ئەویش نەیتوانی هیچ كارێك ئەنجام بدات و لەكۆتاییدا بوغای شەرابی لەگەڵ دوو هەزار سوار بۆ جەنگی كوڕی بوعەیس ڕەوانە كرد.

حەمدویە و كوڕی سەیسیل و زیرەك سەد هەزار داریان لەدارەكانی دەوروبەری مەرند بڕییەوە و پێكەوە بەستیان و كەشكەنجیرەكانیان دانا. كوڕی بوعەیسیش بەم ئەندازەیە كەشكەنجیری دروست كرد و دوژمنەكانی نەیانتوانی لەدیواری شارەكە نزیك ببنەوە و لەماوەی هەشت مانگ سەد سوار لەهاوەڵانی متوەكیل گیانیاندا و چوارسەد كەس بریندار بوون. لەهاوەڵانی كوڕی بوعەیس بەم ژمارەیە كوژران وبریندار بوون. حەمدویە و عەمرۆ زیرەك بەیانی و شەو سەرقاڵی جەنگ بوون. دەستەیەك لەهاوەڵانی كوڕی بوعەیس كەڕمیان بەدەستەوە بوو بەتەناف لەدیوارەكە هاتنەخوار و هێرشیان كردە سەر دوژمن و كاتێك ڕووبەرووی هێرشی سوپای خەلیفە دەبوونەوە، لەبن دیوارەكەدا پەنایان دەگرت و گیانی خۆیان ڕزگار دەكرد. هەندێ كات دەرگای قەڵاكەیان دەكردەوە و دەستەیەك دەهاتنەدەر و دەجەنگان و دەگەڕانەوە.

كاتێك بوغای شەرابی لەمەرند نزیك كەوتەوە، عیسا كوڕی شەیخ كوڕی شەلیلی لەگەڵ ئەمان نامەیەك بۆ سەركردەكانی سوپاكەی كوڕی بوعەیس ڕەوانە كرد تا ملكەچی خۆیان بۆ فەرمانەكانی خەلیفە نیشان بدەن. ئەمان نامەیەكی بۆ كوڕی بوعەیس نارد تا گوێڕایەڵی خۆی نیشان بدات. ژمارەیەك لەهاوەڵانی كوڕی بوعەیس بەئەمان نامەكە ڕازی بوون و دەرگای شارەكەیان كردەوە و بەمشێوەیە سوپاكەی متوەكیل ڕۆشتنە ناو شارەكە. كوڕی بوعەیس لەشارەكە هەڵات وسەربازەكانی متوەكیل شوێنی كەوتن و گرتیان. سوپاكەی متوەكیل ماڵی ئەو و هاورێكانیان تاڵان كرد و هەروەها هێرشیان كردە سەر ماڵی ژمارەیەك لەدانیشتوانی شارەكە. دواتر بانگی ئەمانیان بەرز كردەوە. دوو خوشكەكەی كوڕی بوعەیس وسێ كچەكەی و ژمارەیەك لەكەنیزەكانی گیران. بەیانی ئەو ڕۆژە بوغای

شەرابی گەیشت و فەرمانیدا جاڕ بدەن تا هەموان دەست لەتالآنی و تالآن کردن هەڵگرن. نامەی سەرکەوتنی بەناوی خۆیەوە نووسی و کوڕی بوعەیسی ئەسیر کرد.

## ئیتاخ و سەرئەنجامی کاری ئەو

ئیتاخ کۆیلەیەك بوو کەچێشتی بۆ سەلام کوڕی ئەبرەش دروست دەکرد. موعتەسەم لەساڵی ١٩٩/ ٨١٤ زایینی ئەوی کڕییەوە. ئەو گەنجێکی بوێر بوو. موعتەسەم و واسق پێگەی ئەویان بەرز کردەوە و کارە گەورەکانیان پێ سپارد کەیەکێك لەو کارانە هاورێیەتی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لەبەرێوەبردنی کاروبارەکانی سامەرا بوو.

موعتەسەم مەبەستی کوشتنی هەر کەسێکی دەکرد، بەئیتاخی دەسپارد. لەیەکەم گیراوەکانی مەئمون کوڕی سەندس و کوڕی زیات و ساڵح کوڕی عوجەیف وکەسانی دیکە بوون. ئەو لەرۆژگاری متوەکیل لەهەمان پێگەدا مایەوە و سوپاسالاری سوپا و فەرماندەی پاسەوانەکانی مەغربی و گەورەی تورکەکان بوو. گەنجخانە و بەرید (پۆست) و پەردەداری ماڵی خەلیفە لەدەستی ئەودا بوو.

کاتێك متوەکیل خەلافەتی گرتەدەست، شەوێك شەرابی خواردەوە و مەست بوو، بەشێوەیەکی توند لەگەڵ ئیتاخ هەڵس و کەوتی کرد. ئیتاخ بڕیاریدا متوەکیل لەناو ببات. لەبەرەبەیاندا متوەکیلیان لەمەبەستەکەی ئەو ئاگادار کردەوە. ئەو داوای لێبوردنی لەمتوەکیل کرد و وتی: تۆ باوکی منیت و من دەست پەروەردەی تۆم. متوەکیل چەند کەسێکی راسپارد تا ئیتاخ بۆ ڕۆشتن بۆ ماڵی خواوەند هان بدەن. ئەو داوای مۆڵەتی حەجی کرد و متوەکیل مۆڵەتی پێدا و وەك فەرمانڕەوایی هەر شارێك دەستنیشانی کرد کەدەڕواتە ناوی. هەروەها پاداشی پێدا و هەموو سوپاییەکان بەرێیان کرد. کاتێك ڕۆشت، پەردەداری لەمانگی زیقەعدە/ مەی بەوەسیف سپارد. دەڵێن: ئەم پێشهاتە لەساڵی ٢٣٣/٨٤٧ زایینی روویدا.

## ناسازگاری لەئەفریقییە

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی سولەیمی تەجیبی ناسراو بەقوەیع، دژی محەممەد کوڕی ئەغلەب پاشای ئەفریقییە شۆڕشی کرد. محەممەد سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد و ئەو لەم ساڵەدا گەمارۆی خستە سەر تونس بەڵام سوپاکە بەمەبەستی خۆیان نەگەیشتن و گەڕانەوە.

لەساڵی ٨٤٩/٢٣٥ زایینی، کوڕی ئەغلەب سوپایەکی دیکەی ڕەوانە کرد و دوو سوپا لەنزیکی تونس ڕووبەڕووی یەك بوونەوە بەڵام ژمارەیەك لەسەربازەکانی کوڕی ئەغلەب جیابوونەوە و پەیوەستی قوەیع بوون. بەم شێوەیە سوپاکەی کوڕی ئەغلەب هەڵات و قوەیع پێگەی بەرز بوویەوە. لەساڵی ٨٥٠/٢٣٦ زایینی، محەممەد کوڕی ئەغلەب سوپایەکی دیکەی ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەگەڵ سوپاکەی قوەیع جەنگا. ئەم جارەیان قوەیع شکستی خوارد و ژمارەیەکی بەرچاوی سوپاکەی کوژران. لەم جەنگەدا سەربازێك خۆی بەقوەیع گەیاند و سەری لەجەستە جیا کردەوە. سوپاکەی کوڕی ئەغلەب بەشمشێری دەرکێشراو لەجومادی الاوەلی ئەم ساڵە، نۆڤەمبەری ٨٥٠ زایینی ڕۆشتنە ناو تونس.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود کوڕی عیسا کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی موبەشیر کوڕی ئەحمەدی شەقەفی موتەکەلیم و یەکێك لەموعتزیلەکانی بەغداد، مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی خوسەیمە زوهەیر کوڕی حەرب کەحەدیسی لەبەر بوو لەمانگی شەعبان/ فەوریە مرد. باوکی ئەیوب سلێمان کوڕی داود کوڕی بیشری موقری بەسری، ناسراو بەشازکونی لەئیسفەهان کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی جەعفەر ناسراو بە کوڕی مەدینی حافز، مرد. دەستەیەك ساڵی مەرگی ئەو بە٨٤٩/٢٣٥ زایینی دەزانن. ئەو پێشەوایەکی بڕواپێکراو و لەگێڕانەوەی حەدیس، بەکەسێکی لاواز لەقەڵەم دەدرا. ئیسحاق

کوڕی ئیسماعیلی تاڵەقانی و یەحیا کوڕی ئەیوبی موقابری و ئەبوبەکر کوڕی باوکی شەیبە و باوکی رەبیعی زوهەرانی (لەزانا گەورەکانی سونی و یەکێك لەپێشەواکانی چوار مەزهەبەکە) لەم ساڵەدا کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و پێنجی کۆچی ( ٨٤٩ زایینی )

### کوژرانی ئیتاخ

پێشتر ناسازگاری ئەومان لەگەڵ متوەکیل وچۆنیەتی ڕۆشتنی ئەومان بۆ ماڵی خواوەند باس کرد. کاتێك لەمەککە گەڕایەوە، متوەکیل نامەیەکی بۆ ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم نووسی و فەرمانی پێدا ئیتاخ زیندانی بکات.

متوەکیل بۆ فریودانی ئیتاخ، چەندین دیاری گرانبایی بۆ سەر ڕێگەی ئیتاخ نارد. کاتێك ئیتاخ لەبەغداد نزیك کەوتەوە، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم پێشوازی لێکرد. ئیتاخ مەبەستی ئەوەی کرد لەرێگەی ئەنبارەوە بەرەو سامەرا بڕوات بەڵام ئیسحاق نامەیەکی بۆ نووسی: سەروەری باوەڕداران فەرمانی داوە بڕۆیتە ناو بەغداد تا منداڵەکانی هاشم و گەورەکان بتبینن و لەکۆشکی خوزەیمە کوڕی خازم بمێنیتەوە و پاداشت بەسەرداران کەرانی خۆت بدەیت.

ئیتاخ ڕۆشتە ناو بەغداد و ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم سەردانی کرد. کاتێك ئیسحاق ئەوی بینی، ویستی بۆ ڕێزگرتن لەئیتاخ لەئەسپەکەی بێتەخوار بەڵام ئیتاخ سوێندیدا ئەو کارە نەکات. ژمارەی خزمەتکاران و هاوڕێیانی ئیتاخ دەگەیشتە سێسەد کەس. کاتێك ئیتاخ گەیشتە بەر دەرگای کۆشکی خوزەیمە، ئیسحاق بۆ ڕۆشتنە ناوەوەی ئەو وتی: خواوەند ئەمیر پایەدار بکات و ئیتاخ ڕۆشتە ناو، ئیسحاق لەبەر دەرگا وەستا و مۆڵەتی ڕۆشتنە ژوورەوەی بەهاوەڵانی نەدا و چەندین پاسەوانی بۆ دەرگا دانا. کاتێك ئیتاخ ئەم بارودۆخەی بینی، وتی: ئەنجامیاندا ئەوەی ویستیان و تەنیا لەبەغداد دەیانتوانی ئەو کارە بکەن. ئەوان دوو کوڕەکەی مەنسور و موزەفەر و دوو دەبیرەکەی سلێمان کوڕی وەهب و قودامە کوڕی زیادیان لەگەڵ ئەودا گرت و لەبەغداد زیندانیان کردن.

ئیتاخ پەیکی بۆ لای ئیسحاق نارد و وتی: دەزانی موعتەسەم و واسق فەرمانیان بەمندا چی لەتۆ بکەم بەڵام پشتی تۆم بەرنەدا کەواتە نێوەنجیگەری بۆ دوو کوڕەکەم بکە، خۆم سەختی و خۆشییەکانی ژیانم پشت سەرناوە و ترسم نییە لەوەی چی دەخۆم و چی دەخۆمەوە. ئەم دوو گەنجە هێشتا ڕووبەرووی

سەختییەکان نەبوونەتەوە، خورادنێکی خۆشیان بۆ بێنە.

ئیسحاق ئەو کارەی کرد بەڵام ئیتاخی زیندانی کرد و زنجیرێکی هەشتا ڕەتڵی بەملەوە هەڵواسی. ئەو لەمانگی جومادی الاخرەی ساڵی ٢٣٥/ ٨٤٩ زایینی، مرد. ئیسحاق دەستەیەك لەگەورەکانی بەشایەت گرت بۆ ئەوەی خەڵکان بزانن هیچ نیشانەیەك لەلێدان یا قامچی و ئەشکەنجە بەجەستەیەوە نییە.

دەستەیەك دەڵێن: خواردنیان دەرخوارددا بێ ئەوەی خواردنەوەی پێ بدەن و لەتینواندا مرد. دوو کوڕەکەی تا ئەو کاتەی متوەکیل زیندوو بوو، زیندانی بوون بەڵام کاتێك مونتەسیر هاتە سەرتەخت ئەوانی ئازاد کرد. موزەفەر سێ مانگ دوای ئازادی لەزیندان مرد بەڵام ساڵەکانی تەمەنی مەنسور درێژ بوویەوە.

## گرفتاری کوڕی بوعەیس و مەرگی ئەو

لەم ساڵەدا بوغای شەرابی لەمانگی شەوال/ ئاوریل کوڕی بوعەیس و جێگرەکەی ئەو باوکی ئەغەر و دوو براکەی سەقەر و خالید و دەبیرەکەی عەر و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەوی لەگەڵ خۆی هێنا. کاتێك لەسامەرا نزیك کەوتنەوە، ئەوانی سواری وشتر کرد تا هەموان بیانبینن. کاتێك کوڕی بوعەیس ڕووبەرووی متوەکیل وەستا، متوەکیل فەرمانیدا سەری ببڕن. جەلاد هات. متوەکیل جوێنی پێدا و وتی: چ شتێك بۆ ئەم کارە ناچاری کردیت؟ کوڕی بوعەیس وەڵامی دایەوە: بەدبەختی، تۆ ئەو تەنافەیت کە لەنێوان ئافرێنەر و ئافرێنراوەکانی درێژ بۆتەوە، دوو گومانم هەیە کەیەکیان زیاتر شیاوە بۆ تۆ و ئەویش بەخشینی منە، ئەوسا دەستبەجێ ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| ابی الناس الا انك اليوم قاتلی | امام الهدی و الصفح بالمرء اجمل |
| و هل انا الا جبلة من خطيئة | و عفوك من نور النبوة يجبل |
| فانك خير السابقين الی العلی | و لا شك ان خير الفعالين تفعل |

واتاکەی: ئەی پێشەوای ڕێنیشاندەر، خەڵکان جگە لەوە نازانن کەتۆ ئەمڕۆ گیانی من دەگریت بەڵام بەخشین بۆ مرۆڤ ڕازاوەترە. ئایا من جگە لەتێکەڵی گوناح شتێکی دیکەم بەڵام تۆ لەنوری پێغەمبەریت پێبڕاوە. تۆ چاکەکارترین کەسێکی کە

بەرەو لوتکەی لەپێشی سەرکەوتوون و بێ گفتوگو لەنێوان دوو کار، باشترین ئەنجام دەدەیت.

متوەکیل رووی کردە یەکێك لەهاوەڵانی خۆی و وتی: ئەو کەسێکی ئەدیبە، ئەو لەوەڵامی متوەکیلدا وتی: سەروەری باوەڕداران چاکەی لەگەڵ بکات و قەرزارباری بکات.

متوەکیل فەرمانیدا بیگەڕێننەوە و زیندانی بکەن. دەڵێن: موعتەز لای باوکی نێوەنجیگەری بۆ کرد و متوەکیل ئازادی کرد. کوڕی بوعەیس لەکاتی هەڵاتن ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| کم قد قضیت امورا کان اهملها | غیری و قد اخ الافلاس بالکظم |
| لا تعذلینی فمالی لیس ینفعنی | الیك عنی جری المقدار بالقلم |
| ساتلف المال فی عسر و فی یسر | ان الجواد الذی یعطی علی العدم |

واتاکەی: چەندە کارم ئەنجامدا کەکەسانی دیکە پشتگوێیان خست لەگەڵ ئەوەی هەژاری من هۆکاری سەرنەکەوتنم بوو. بۆ ئەوەی سوودی نییە سەرکۆنەم مەکە، دەست لەمن هەڵگرە چوونکە چارەنوس دیاریکراوە. سامان لەکاتی دارایی و نەداری بەفیرۆ دەدەم و بەخشندە ئەو کەسەیە لەکاتی نەداریدا ببەخشێت.

کوڕی بوعەیس یەك مانگ دوای ڕۆشتن بۆ سامەرا مرد. زنجیرێکیان بەقورسایی سەد ڕەتل بەملیەوە هەڵواسی و بەملیەوە بوو تا ئەو کاتەی گیانیدا. مناڵەکانی جەلیس، سەقەر و بوعەیس لەگەڵ عوبەیداللە کوڕی یەحیا کوڕی خاقان پیشەی نۆکەرییان هەڵبژارد.

## بەیعەت بۆ مناڵەکانی متوەکیل

لەم ساڵەدا متوەکیل بۆ سێ کوڕەکەی محەممەد بەنازناوی مونتەسیر باللە و باوکی عەبدوللە محەممەد و بەگومانێك تەڵحە یا زوبەیر بەنازناوی موعتەز باللە و ئیبراهیم بەنازناوی مۆئەییەد باللە بەیعەتی بۆ خەلافەت وەرگرت و بۆ هەرکام دوو ئاڵای هەڵکرد، یەکیان ڕەش کەنیشانەی جێگری بوو و یەکیان سپی کەنیشانەی سالاری ئەوان بوو. ئەو بەهەرکام لەمناڵەکانی چەندین ویلایەتی سپارد کەهەنووکە

ئاماژەیان پێ دەدەین:

ئەو ویلایەتانەی بەمونتەسیری سپارد بریتی بوون لەئەفریقییە و هەموو مەغریب و شارە گەورەکان و قێنسرین و سنورەکان و شامات و جەزیرە و سەرزەمینی میسر و دیاری رەبیعە و موسڵ و هەیت و عانە و ئەنبار و خابور و ئاوەدانییەکانی باجەرمی و ئاوەدانییەکانی دیجلە و بەشەکانی دەوروبەری عێراق و حەرەمەین و یەمەن و حەزەرمەوت و یەمامە و بەحرەین و سند و موکران و قەندابیل و سنوری بەیت ئەلزەهب و ئاوەدانییەکانی ئەهواز و زەوییە سەرسەوزەکانی سامەرا و ویلایەتی کوفە و ویلایەتی بەسرە و ماسەبزان و مێهرجانقەزەق و شارەزور و سامەغان و ئیسفەهان و قوم و کاشان و کێوەکان (زاگرۆس و کرمانشان) و ماڵیاتی عەرەبەکان لەبەسرە.

ئەو ویلایەتانەی بەموعتەزی سپارد بریتی بوون لەخوراسان و دەوروبەری و تەبەرستان و رەی و ئەرمەنستان و ئازەربایەجان و ئاوەدانییەکانی فارس و لەساڵی ٨٥٤/٢٤٠ زایینی گەنجخانەی هەموو کەنارەکان و زەرابخانەکانی پێسپارد و فەرمانیدا ناوی لەسەر درهەمەکان هەڵکەنن.

سوپاکەی دیمەشق و فەلەستینی خستە ژێر فەرمانی مۆئەییەد.

## خۆ بە پێغەمبەر زانینی پیاوێك

لەم ساڵەدا لەسامەرا پیاوێك بەناوی مەحمود کوڕی فەرەجی نەیشابوری دەرکەوت. ئەو خۆ بەپێغەمبەر و زولقەرنەین دەزانی و بیست و حەوت کەس باوەڕیان پێ هێنا و دوو کەس لەهاوەڵانی ئەو لەباب ئەلعامە و دوو کەسی دیکە لەبەشی رۆژهەڵات قوتبوونەوە. خۆی و هاورێکانیان گرت و بردیانە لای متوەکیل. متوەکیل فەرمانیدا ئەشکەنجەی بکەن و بیبەنە باب ئەلعامە و ئەو خۆی لەوێ بەدرۆزن ناساند. متوەکیل فەرمانی بەهاورێکانی مەحموددا هەرکام شەقەزللەیەك لەروخساری مەحمود بدەن و ئەوان لێیاندا. نامەیەکیان لەو بەدەست هێنا کەتیایدا نووسرابوو ئەمە قورئانەکەیەتی و جبرەئیل بۆی ناردووە. ئەو لەمانگی زیحەجە/ ژوئەن بەهۆی ئەشکەنجەی فراوانەوە مرد و هاوەڵانی زیندانی کران. لەناو هاوەڵانی

پیرەپیاوێك دەبینرا کەئەویش خۆی بەپێغەمبەر دەزانی وگومانی دەکرد وەحی بۆ دێتە خوار.

## ڕووداوەکانی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی وەلید ناسراو بەتەبەلی لەکەنارەکانی تەدمور بۆ جەنگ لەگەڵ دەستەیەك کەپیاوێك بەناوی محەممەد کوڕی عیسایان وەك فەرماندەی خۆیان دەستنیشان کردبوو، بەرێکەوت. عەباس ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ئەوان و لەگەڵ سوپاکەی محەممەد کوڕی عیسا جەنگی. ئارامی بۆ ئەو سەرزەمینە گەڕاندەوە و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا خەڵکانی تاکورنا و بەربەرەکانی دراوسێیان شۆڕشیان کرد. سوپاکەی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس، ڕووبەڕوویان بوونەوە و جەنگان و سەرکوتی کردن.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان، مونزەری کوڕی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ڕۆمییەکان ڕەوانە کرد و خۆیان گەیاندە ئەلبە.

هەروەها لەرەجەبی ئەم ساڵە/ ژانویە، لافاوێکی گەورە لەپانتایی سەرزەمینی ئاندۆلۆس کەوتەڕێ و پردی ئستەجە(ئەسیخا) و ئاشەکانی وێران کرد. و ڕووباری ئەستەبیلە(سیویلیا) شانزە گوندی قوتدا و ڕووباری تاجە هەژدە گوندی خاپور کرد. پانای ئەم ڕووبارە سی میل بوو. کارەساتێکیماڵوێرانکەر بوو کە لەماوەی یەك مانگ هەموو سەرزەمینی ئاندۆلۆسی گرتەوە.

لەم ساڵەدا ڕەدمیر منالی ئەزفونش لەمانگی ڕەجەب/ ژانویە مرد. ئەو هەشت ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد.

لەم ساڵەدا باوکی سەول سەعید کوڕی یەعمەر کوڕی عەلی شاعیر لەسەرقەستە (ساراگوزا) چاوی لێکنا.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا متوەکیل فەرمانی بەئەهلی زەممەدا عابای هەنگوینی ڕەنگ لەبەر بکەن و پشتێن ببەستن و زینی ئەسپەکانیان دارین بێت و دو گۆی بەدوای زینەکەوە هەڵواسرا بێت و لەسەر جلی کۆیلەکانیان دوو تیکە قوماش بدوورن جیاواز لەرەنگی جل و بەرگەکانیان کەئەندازەی هەر تیکەیەك لەچوار پەنجە تێنەپەڕێت و ڕەنگی هەرکام لەم دوو تیکە لەرەنگی ئەوی دیکە جیاواز بێت. هەر ژنێك کەدەهاتەدەر دەبوا جل و بەرگی هەنگوینی لەبەردا بوایە. متوەکیل ڕێگەی نەدا جل و بەرگی خۆماڵی خۆیان لەبەر بکەن و فەرمانیدا کەنیسە و خانەقا تازە نۆژەن کراوەکان وێران بکەن و لەهەر ماڵێك ماڵیاتی دەیەك وەربگرن و لەسەر دەرگای ماڵەکان روخساری دارینی شەیتان هەڵواسن. ڕێگەی نەدا بۆ کارەکانی حکومەت کەڵکیان لیٚ وەربگیرێت. هیچ موسوڵمانێك نەدەبوا هیچیان فێر بکات و لەجەشنی شەعانین نەدەبوا خاچ هەڵگرن، نەدەبوا لەرێگەدا خاچیان بەدەستەوە ببینرێت. متوەکیل فەرمانیدا گۆڕستانەکانیان هەڵدەنەوە و لەگەڵ زەوی یەکسانی بکەن. ئەم فەرمانەی بۆ هەموو ناوچە و کەنارەکان نووسی.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی حسەین کوڕی موسعەبی موسعەبی، برازای تاهیر کوڕی حسەین کە لەرۆژگاری مەئمون و موعتەسەم و واسق و متوەکیل لەبەغداد فەرماندەی پاسەوانەکان بوو، مرد. کاتێك نەخۆش کەوت، متوەکیل، موعتەزی کوڕی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان بۆ هەواڵ پرسی ڕەوانەی ماڵەکەی ئەو کرد. متوەکیل لەمەرگی ئەو خەمبار بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی سەهل کۆچی دوایی کرد. ئەو لەخواردنی دەرمان بەرادەیەك زێدەڕۆیی کرد کەچیتر درەمانەکان کارگەرییان نەما و بەهۆیەوە مرد. مەرگی ئەو و ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لەمانگی زیحەججە/ ژوئەن لەیەك رۆژدا بوو. دەستەیەك ساڵی مردنی حەسەن بە٢٣٦/٨٥٠ زایینی دەزانن.

هەروەها لەزیحەججە/ژوئەنی ئەم ساڵە رەنگی ئاوی دیجلە بۆ سێ رۆژ زەرد و ترسی خەڵکانی لێکەوتەوە. دواتر ئاوەکە رەنگی ئاسایی خۆی بەدەست هێنایەوە.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی عومەر کوڕی یەحیا کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی

حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان گرت و بردیانە لای متوەکیل. متوەکیل قامچی بارانی کرد و خستیە زیندانەوە. ئەو دەستەیەکی کۆکردبوویەوە تا شۆڕش بکات. محەممەد کوڕی داود لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی موسڵی موسیقیزان و ئاواز ناس کەشارەزای ئەدەب و هونەری و شاعیریش بوو، مرد. عوبەیداللەی کوڕی عومەر کوڕی مەیسەرەی جوشەمی قەواریری لەمانگی زی حەججە/ ژوئەن و ئیسماعیل کوڕی عولیە و مەنسور کوڕی باوکی موزاحیم و سورەیج کوڕی یونس، باوکی حەرەس، هەمووان کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و شەشی کۆچی ( ٨٥٠ زایینی )

## کوژرانی محەممەد کوڕی ئیبراهیم

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەب برای ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوژرا.

چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو کەئیسحاق، محەممەدی کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، کوڕی خۆی بۆ بارەگای خەلیفە نارد تا جێگری ئەو بێت. کاتێك ئیسحاق مرد، موعتەز، محەممەد کوڕی ئیسحاقی وەك فەرمانڕەوای فارس دەستنیشان کرد و لەموحەڕەم/ ژوئیەی ئەم ساڵە مونتەسیر فەرمانڕەوایی یەمامە و بەحرەین و مەککەی پێ سپارد و متوەکیل هەموو کارەکانی ئیسحاقی خستە ئەستۆی ئەو. محەممەد هەموو سامان و کالاّ گرانباییەکان کە لەباوکی بەجێ مابوو، بەمتوەکیل و کوڕەکانی بەخشی.

مامی محەممەد، محەممەد کوڕی ئیبراهیم کەفەرمانڕەوایەتی فارسی دەکرد، لەچۆنیەتی چاکییەکانی متوەکیل و منالەکانی بۆ برازاکەی خۆی ئاگادار و خەمبار بوو و ڕقی خەلیفە و برازاکەی لەدڵ گرت. محەممەد کوڕی ئیسحاق سکالاّی بۆ دەرگای متوەکیل بەرز کردەوە و متوەکیل دەستی محەممەد کوڕی ئیسحاقی ئاوەلاّ کرد تا بەوشێوەی دەخوازێت لەگەڵ مامی هەڵس و کەوت بکات. ئەو مامی لەفەرمانڕەوایەتی فارس دوور خستەوە و کوڕە مامەکەی حسەین کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی موسعەبی لەجێگەی ئەو دانا و فەرمانی پێدا خوێنی محەممەد کوڕی ئیبراهیم بڕێژێت.

کاتێك حسەین گەیشتە فارس، لەجەژنی نەورۆز چەندین دیاری گرانبایی بۆ مامی نارد کەکەمێك حەڵوا لەناویاندا بوو. محەممەد لێ خوارد حسین ئەوی لەماڵێکدا زیندانی کرد و پاسەوانی بۆ دانا. حسەین داوای ئاوی کرد بەلاّم پێی نەدرا تا ئەوەی دوای دوو ڕۆژ لەئازاری تینویەتی گیانی سپارد.

**فەرمانی متوەکیل بۆ وێران کردنی ئارامگای حسەین کوڕی عەلی**

**لەم ساڵەدا متوەکیل فەرمانیدا ئارامگای حسەین کوڕی عەلی و ماڵەکانی دەوروبەری وێران و خاپور بکەن و دواتر بیکێڵن و ئاوی بدەن و ڕێگەی سەردان کردنی ئەو شوێنە بەخەڵکان نەدەن. عامل سەرکردەی پاسەوانەکان لەم ناوچەیە جاڕیدا: دوای سێ ڕۆژ هەرکەس لەسەر گۆڕەکەی حسەین کوڕی عەلی ببینم، گرفتار وبۆ زیندانی مەتبەقی دەنێرم. خەڵکان هەڵاتن و چیتر کەس سەردانی گۆڕەکەی نەکرد. ئەو شوێنەیان کێڵا و ئاویاندا و چاندیان.**

**متوەکیل لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و بنەماڵەکەی بێزار بوو، ئەگەر ئاگادار دەبوویەوە کەسێك شوێنکەوتەی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، دەستی بەسەر سامانەکەیدا دەگرت و دواتر دەیکوشت. یەکێك لەهاونشینەکانی متوەکیل عوبادە کوڕی موخەنەس بوو. ئەو سەرینێکی لەسەر سکی خۆی دەبەست و سەری تاسی خۆی دەردەخست و لەبەردەم متوەکیل سەمای دەکرد و گۆرانیبێژەکان دەیانخوێند: کەچەڵی ورگ زل و خەلیفەی موسوڵمانان هات و بەمشێوەیە لاسایی عەلی کوڕی ئەبی تالبی دەکردەوە، متوەکیل دەیخواردەوە و بەم بەزمە پێدەکەنی. ڕۆژێك ئەم بەزمەی دووبارە کردەوە و مونتەسیری کوڕی ئامادەی ئەم دانیشتنە بوو. ئیشارەی لەعوبادە کرد و ئەوی ترساند و عوبادە بێدەنگ بوو. متوەکیل پرسی: چیت بەسەر هات؟ ئەویش هەستا و ئاگاداری کردەوە. مونتەسیر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ئەو کەسەی ئەم پیاوە لاسایی دەکاتەوە و خەڵکان دەهێنێتە پێکەنین، کوڕە مام و گەورەی بنەماڵەی تۆیە و پێویستە شانازی پێوە بکەیت، ئەگەر دەخوازیت گۆشتی بخۆ بەلأم ڕێگە مەدە ئەم سەگانە بەمشێوەیە هەڵس و کەوت کەن. متوەکیل بەگۆرانبێژەکانی وت: هەمووتان بەمشێوەیە بخوێنن:**

غار الفتی لابن عمه راس الفتی فر حرامه

**واتاکەی: ئەو گەنجە بۆ کوڕە مامەکەی دەمارگیر بووە، سەری ئەم گەنجە بەفلأن شوێنی دایکی.**

**ئەمە یەکێك بوو لەو هۆکارانەی مونتەسیر کوشتنی متوەکیلی بەڕەوا زانی. دەڵێت: متوەکیل، خەلیفەکانی پێش خۆی، مەئمون، موعتەسەم و واسقی بۆ**

شەیدا بونیان بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و بنەماڵەکەی سەرکۆنە دەکرد و ئەوکەسانەی هاونشینی بوون، بەدوژمنایەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناویان دەرکردبوو. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: عەلی کوڕی جوهم، شاعیری شامی لەمناڵەکانی شامە کوڕی لۆئەی و عومەر کوڕی فەرەحی روخەجی و باوکی سەمت لەمناڵەکانی رەوان کوڕی باوکی حەفسە لەموالییەکانی مناڵەکانی ئومەییە و عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی داودی هاشمی ناسراو بە کوڕی ئەترەجە.

ئەم دەستەیە متوەکلیان لەعەلەوییەکان ترساند و بۆ دوور خستنەوەی ئەوان هانیان دەدا. ئەوان خراپە وتنی عەلەوییەکانیان بەڕەوا دەزانی و بەردەوام لای متوەکیل خراپەی ئەویان دەهێنایە سەر زمان تا ئەو جێگەی ئەوەی لێکەوتەوە کەلێی کەوتەوە و ئەم کارە قێزەونانەی، بووە هۆی سڕینەوەی چاکەکارییەکانی. ئەو لەکردار یەکێك لەباشترینی خەڵکان بوو تا ئەو جێگەی لەگەڵ کردەوە چاکەکانی رێگەی لەباوەڕی خەڵکان بەئافراندنی قورئان گرت.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا متوەکیل، عوبەیداللە کوڕی یەحیا کوڕی خاقانی وەك دەبیری خۆی دیاریکرد.

لەم ساڵەدا مونتەسیر لەگەڵ دایکی متوەکیل حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی سەعید محەممەد کوڕی یوسفی مەروزی لەناکاو مرد. ئەو فەرمانڕەوایەتی ئەرمەنستان و ئازەربایەجانی دەکرد. تایەکی پێڵاوەکەی لەپێ کرد و ویستی تاکەی دیکەی پێڵاوەکەی لەپێ بکات بەڵام کەوت و مرد. متوەکیل، یوسفی کوڕی هاوشێوەی باوکی، وەك سوپاسالاری سوپاکەی دەستنیشان کرد و کۆکردنەوەی خەراجی ئەو ناوچەی پێ سپارد. یوسف بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت و کاروبارەکانی ساماندا.

لەم ساڵەدا مونتەسیر رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا حەبیبی بەربەری لەکێوەکانی جەزیرەی ئاندۆلۆس شۆڕشی کرد و ژمارەیەکی زۆر پەیوەستی بوون و تالآن کردنیان کردە پیشە و دەستدرێژیان بۆ

سەر سامانی خەڵکان کرد. سوپاکەی عەبدولرەحمان رووبەروویان بوویەوە و شکستی پێهێنان وبلاوەیان لێکرد.

لەم ساڵەدا سوپایەکی ئاندۆلۆسی لەگەڵ دانیشتوانی بارسلۆنا جەنگی و ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکەکەی کوشت، دواتر کوشتارێکی گشتی دەستپێکرد و ژمارەیەکی بەرچاوی ئەسیر و تالآنی زۆری کۆکردەوە و هەموان تەندروست گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا هودبە کوڕی خالید و سەنانی ئۆبۆلی و ئیبراهیم کوڕی محەممەدی شافعی مردن.

لەم ساڵەدا موسعەب کوڕی عەبدولله کوڕی سابت کوڕی عەبدولله کوڕی زوبەیر کوڕی عەوام باوکی عەبدوللەی مودەنی کەکوڕە مامی زوبەیر کوڕی بوکار بوو، لەتەمەنی هەشتا ساڵی کۆچی دوایی کرد. ئەو هیچ خاڵێکی نگەتیڤ و لاوازی نەبوو جگە لەوەی دژایەتی شوێنکەوتنی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالبی دەکرد.

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی مەهدی و محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی محەممەدی مەخزومی موسەیبی بەغدادی، مردن.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی حەربی هەمەدانی یەکێك لەپێشەواکانی موعتەزیلەی بەغدادی لەتەمەنی پەنجا و نۆ ساڵی ئەم دنیایەی بەجێهێشت. ئەو کلامی لەکوڕی باوکی هوزەیل عەلاف بەسری فێر ببوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی حەوت کۆچی ( ٨٥١ زایینی )

## شۆڕشی خەڵکانی ئەرمەنستان دژی کارگوزارەکەی خۆیان

لەم ساڵەدا خەڵکانی ئەرمەنستان دژی کارگوزارەکەی خۆیان، یوسف کوڕی محەممەد شۆڕشیان کرد و کوشتیان.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك یوسف ڕێگەی ئەرمنستانی گرتەبەر، بەتریقێك بەناوی بوقرات کوڕی ئەشوت (بەبەتریقی بەتریقیەکان ناویان دەبرد) هاتە لای یوسف و داوای ئەمانی کرد بەڵام یوسف خۆی و کوڕەکەی گرت و ڕەوانەی بارەگای خەلیفەی کرد. بەم شێوەیە بەتریقەکانی ئەرمەنستان لەگەڵ برازای بوقرات کوڕی ئەشوت کۆبوونەوە و سوێندیان خوارد خوێنی یوسف بڕێژن. موسا کوڕی زورارەیش پەیوەستیان بوو. ئەو زاوای بوقرات بوو. یوسف لەم کۆبوونەوەیە ئاگادار بوویەوە و هاوەڵەکانی پێشنیاریان پێکرد ئەو شوێنە بەجێبێڵێت بەڵام یوسف ڕازی نەبوو. کاتێك زستان دەستی پێکرد و بەفر باری، دوژمنەکانی یوسف چاوەڕوان بوون تا بەفر بارین کۆتایی پێهات، دواتر هێرشیان کردە سەر شوێنەکەی یوسف کەشاری تەرون بوو. گەمارۆیان خستە سەر شارەکە. یوسف لەشارەکە هاتەدەر و شەڕی دەستپێکرد بەڵام ئەرمنییەکان خۆی و هاوەڵانیان کوشتار کرد. ئەو سەربازانەی یوسف کەجەنگیان نەکرد بەفەرمانی ئەرمەنییەکان جلەکانیان لەبەر داکەند و بەرووتی گیانی خۆیان دەرباز کرد و پێپەتی ڕێگەی سارایان گرتەبەر. ژمارەیەکی زۆریان لەسەرمادا مردن و بەهەمان شێوە پەنجەی ژمارەیەکیان سەرما بردی و ڕەش بوویەوە. دەستەیەکیش ڕزگاریان بوو. ئەم پێشهاتە لەمانگی ڕەمەزان/ فەوریە ڕوویدا.

یوسف زۆربەی سوپاکەی خۆی لەگوندەکانی دەوروبەر بڵاوە پێکردبوو. بەتریقەکان بۆ هەر دەستەیەك لەوان دەستەیەك جەنگاوەریان ڕەوانە کرد و لەماوەی یەك ڕۆژدا قەلاچۆیان کردن.

کاتێك هەواڵی ئەم جەنگ و کوشتارە بەمتوەکیل گەیشت، بوغای گەورەی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد تا تۆڵەی یوسف بستێنێت. بوغا ڕێگەی موسڵ و

جەزیرەی گرتەبەر. ئەو جەنگی لەئازەرنەوە دەستپێکرد. موسای زوراره و براکانی، ئیسماعیل، سلێمان، حەمد، عیسا، محەممەد و هارون هەموویان لەم سەرزەمینەدا بوون. بوغا، موسای زورارەی بۆ لای متوەکیل نارد و کوشتنی بکوژەکانی یوسفی بەرەوا زانی و نزیکەی سی هەزار کەسی لێ کوشتن. ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد و فرۆشتی و رووی کردە سەرزەمینی باق و ئەشوت کوڕی حەمزە باوکی عەباس، کارگوزاری باقی ئەسیر کرد. باق لەئاوەدانییەکانی بسفرجان بوو. دواتر بوغا بەرەو شاری دەبیلی ئەرمەنستان بەرێکەوت و ماوەی یەك مانگ لەوێ مایەوە. دواتر رووی کردە تفلیس و گەمارۆی خستە سەر شارەکە.

## توڕە بوونی متوەکیل لەکوڕی باوکی دۆئاد و دانانی کوڕی ئەکسەم لەجێگەی ئەو

لەم ساڵەدا متوەکیل لەئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد توڕە بوو و دەستی بەسەر زەمین و سامانی ئەودا گرت و کوڕەکەی باوکی وەلید و مناڵەکانی دیکەی زیندانی کرد. باوکی وەلید سەد و بیست هەزار دینار و چەندین گەوهەری گرانبایی کەبەهاکەی بەبیست هەزار دینار خەملێنرا، تەسلیمی کرد و دواتر بڕیاردرا شانزە هەزار درهەم کۆبکاتەوە و بیدات. چەند کەسێك بەشایەت وەرگیرا و دواتر ئازاد کرا. ئەم پارەیە لەفرۆشتنی زەوییەکانی ئەوان دابین کرا.

باوکی ئەوان، ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد شەل ببوو. متوەکیل، یەحیا کوڕی ئەکسەمی لەبەغدادەوە بۆ سامەرا بانگ کرد و ئەوی وەك قازی قازییەکان دیاریکرد. دواتر لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی هەموو ستەم لێکراوەکانی بەو سپارد. یەحیا کوڕی ئەکسەم دادیاری بەشی رۆژهەڵاتی بەحەییان کوڕی بیشر و دادیاری بەشی رۆژئاوایی بە سوار کوڕی عەبدوللە سپارد. ئەم دووانە هەردووك یەکچاو بوون. جوماز سەبارەت بەوان ئەم هۆنراوەی هۆنیوەتەوە:

| | |
|---|---|
| رایت من الکبائر قاضیین | هما احدوثة فی الخافقین |
| هما اقتسما العمی نصفین قدرا | کما اقتسما قضاء الجانبین |
| و تحسب منهما من هز رأسا | لینظر فی مواریث و دین |

كانك قد وضعت عليه دنا فتحت بزاله من فردعين

هما فال الزمان بهلك يحيى اذ افتتح القضاء باعورين

واتاکەی: لەدیاردە گرنگەکان ئەوەی دوو دادیارم بینی کە لەرۆژگاردا بەسەرهاتێکی سەیرن. کوێرییان بۆ دوو نیوە دابەش کردووە، بەهەمان شێوە کەدادیاری دوو نیوەیان دابەش کردووە. کاتێك سەریان دەجولێنن، تا لێکۆڵینەوەیەك لەقەرز یا وام بکەن دەڵێی هەرکام خومەرەیەکی لەسەردایە و یەك کونی هەیە و ئەو دوو دادیارە نیگای خۆیان لەو کونەوە (یەك چاوەوە) بەکار دەبەن. ( سەری ئەوان لەخومەرەی یەك کون دەچێت)" ئەو دوو دادیار بەدشانس و چارەڕەشن کەدەبنە هۆی لەناوچوونی یەحیا. چوونکە کاری داوەری بەهەڵبژاردنی دوو یەکچاو هەڵبژاردووە (عەرەبەکان یەك چاویان بەشووم دەزانی).

## فەرمانڕەوای عەباس کوڕی فەزڵ لەسیسیل و گرتنی سەرزەمینەکان لەسەر دەستی ئەو

لەساڵی ٨٤٢/٢٢٨ زایینی باسمان کرد کەمحەممەد کوڕی عەبدوللە فەرمانڕەوای سیسیل (سەقەلییە) لەساڵی ٨٥٠/٢٣٦ زایینی کۆچی دوایی کرد. کاتێك مرد، موسوڵمان لەسەر فەرمانڕەوایی عەباس کوڕی فەزڵ کوڕی یەعقوب رێککەوتن و ئەویان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد و هەواڵی ئەم کارەیان بۆ محەممەد کوڕی ئەغلەب فەرمانڕەوای ئەفریقییە نووسی و محەممەد فەرمانڕەوایی عەباسی پشتراست کردەوە. عەباس پێش گەیشتنی فەرمان دەستی بەتاڵان کردن کرد وچەندین دەستەی بۆ کۆکردنەوەی تاڵانی پێکەوە نا.

کاتێك فەرمانی فەرمانڕەوایی ئەو گەیشت، خۆی فەرماندەیی سوپاکەی گرتە ئەستۆ و ریاحی مامی وەك راوێژکار هەڵبژارد و ئەوی لەگەڵ دەستەیەك بۆ قەڵای ئەبوسور رەوانە کرد. تاڵانی زۆری کۆکردەوە و ژمارەیەکی ئەسیر کرد و گەڕایەوە. ئەو، ئەسیرەکانی کوشت و بەرەو شاری قەسریانە ملی رێگەی گرتەبەر، لەوێ تاڵانی کرد، سوتاندی و هەموو کارە خراپەکانی پێکەوە کۆکردەوە بۆ ئەوەی بەتریق لەپەناگەکەی خۆی بێتەدەر بەڵام بەتریق نەهات و عەباس گەڕایەوە.

لەساڵی ٨٥٢/٢٣٨ زایینی ئەو لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ قەسریانە گەڕایەوە. دووبارە تالآنی کردە پیشە و وێرانی کرد تا گەیشتە قەتانە، ساراگوزا، نوتس (تونس) و رەغوس. لەهەموو ئەم شارانە تەنیا تالآنی دەکرد. شارەکانی سوتاند و وێرانی کرد و لەبەسیرە ئوردووی لێدا و بۆ ماوەی پێنج مانگ گەمارۆی خستەسەر. خەڵکی ئەو سەرزەمینە بەپێدانی پێنج هەزار کۆیلە ئاشتییان لەگەڵ عەباس کرد.

لەساڵی ٨٥٦/٢٤٢ زایینی عەباس لەگەڵ سوپایەکی گەورە رووی کردە پێنج قەلآکە و لەساڵی ٨٥٧/٢٤٣ زایینی رێگەی قەسریانەی گرتەبەر. خەڵکانی شارەکە هاتنەدەر و رووبەرووی بوونەوە بەلآم شکستیان خوارد و هەلآتن. عەباس ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. دواتر مەبەستی هێرش کردنە سەر شاری ساراگوزا و تەبەرمین و شارەکانی دیکەی کرد. لەم شارانەیشدا تالآنی کرد، کوشتی و بڕی و سوتاندی و لەکۆشکی جەدید ئوردووی لێدا و گەمارۆی خستەسەر و بارودۆخی لەرۆمییەکان دژوار کرد. ئەوان رازی بوون پانزە هەزار دیناری پێ بدەن بەلآم عەباس رازی نەبوو و گەمارۆکە درێژەی کێشا. ئەوان رازی بوون قەلآکەی تەسلیم بکەن بەو مەرجەی دووسەد کەس لەوان رزگاری بێت. عەباس رازی بوو و دەستی بەسەر قەلآکەدا گرت و هەموو خەڵکەکەی جگە لەدووسەد کەس فرۆشت و دواتر قەلآکەی وێران کرد.

## چۆنیەتی گرتنی قەسریانە

لەساڵی ٨٥٨/٢٤٤ زایینی. موسوڵمانان دەستیان بەسەر شاری قەسریانەدا گرت. ئەم شارە پایتەختی فەرمانڕەوای سیسیل بوو. فەرمانڕەوای سیسیل پێشتر لەساراگوزا ژیانی بەسەر دەبرد بەلآم کاتێك موسوڵمانان بەشێکی ئەم دوورگەیان خستە ژێر فەرمانی خۆیانەوە، کۆشکەکەی خۆی بۆ شاری قەسریانە گواستەوە.

چۆنیەتی گرتنی ئەو شارە بەمشێوەیە: عەباس لەگەڵ سوپایەك لەموسوڵمانان رووی کردە قەسریانە و ساراگوزا و هێزێکی لەرێگەی دەریاوە ڕەوانە کرد. موسوڵمانان رووبەرووی چل کەشتی جەنگی رۆمی بوونەوە و شەڕ دەستیپێکرد. رۆمییەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان دە کەشتی جەنگی و سەربازەکانیان

وەك تالآنی دەست کەوت و عەباس بۆ شارەکەی خۆی گەڕایەوە.

کاتێك زستان دەستی پێکرد، سوپایەکی ڕەوانە کرد. سوپاکەی عەباس گەیشتە قەسریانە وئەوەی بینیان، فڕاندیان و وێرانیان کرد و گەڕانەوە. لەناو ئەسیرەکان پیاوێك دەبینرا کە لەناو ڕۆمییەکان پێگەیەکی بەرزی بوو. عەباس فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. ئەو وتی: مەمکوژە چوونکە خوازیارم چاکەیەکت لەگەڵ بکەم. عەباس وتی: چ چاکەیەك؟ وتی: قەسریانە بەتۆ دەسپێرم. خەڵکانی قەسریانە لەم زستانە و ئەم بەفرە لەهێرشی ئێوە ئاسودەن و پاسەوانیان نییە. دەستەیەك لەسوپاکەت لەگەڵ من بنێرە تا بڕۆینە ناو شارەکە.

عەباس دوو هەزار شاسواری بوێری هەڵبژارد و ڕۆشتن و لەقەسریانە نزیك کەوتنەوە و خۆیان حەشاردا. عەباس، ریاحی مامی لەگەڵ دەستەیەك ڕەوانە کرد. ئەوان شەوانە ڕێگەیان بڕی. ئەو پیاوە ڕۆمییە قۆلبەست لەبەردەمی ریاحەوە دەڕۆشت. ئەو کەلێنی شارەکەی نیشاندان. سەربازەکان پەیژەکانیان دانا و لەکێوەکە سەرکەوتن و لەنزیك بەرەبەیان گەیشتنە نزیك دیواری شارەکە. لەکاتی خەوی پاسەوانەکان لەکونێکەوە ڕۆشتنە ناو کەزێراوی شارەکە بوو. بەم شێوەیە موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شارەکە.

عەباس لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی گەیشت و هەموویان ڕۆشتنە ناو شارەکە و نوێژی بەیانی پێنجشەممە نیوەی شەوال/ دوشەممە دوانزەی ئاوریلی ٨٥١ زایینیان لەو شارە خوێند و دەستبەجێ بناغەی مزگەوتێکیان داڕشت و مینبەرێکیان بەرز کردەوە و لەڕۆژی هەینی وتاری هەینی خوێنرایەوە. سەربازانی عەباس هەموو جەنگاوەرەکانیان کوشت و کچی بەتریقەکان و زێڕ و خشڵی شازادەکانیان تالآن کرد. بەرادەیەك لەو شارە تالآنییان کرد کەپێنوس توانای باس کردنی نییە.

کاتێك ڕۆمییەکان لەم جەنگە ئاگادار بوونەوە، پاشای ڕۆم سوپاسالارێکی لەکۆنستانتین ئۆپۆلەوە لەگەڵ سێسەد کەشتی جەنگی و سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە ساراگوزا. عەباس بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان شارەکەی بەجێهێشت و دوو سوپا ریزیان بەست و جەنگ دەستی پێکرد.

سوپاکەی عەباس توانی شکستیان پێ بێنن. ڕۆمییەکان سوار کەشتییەکانی خۆیان بوون و هەلاتن. موسوڵمانان سەد کەشتییان وەك تالآنی بۆمایەوە و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازە ڕۆمییەکانیان کوشت. لەم جەنگەدا تەنیا سێ کەس لەموسوڵمانان بەهۆی تیرەوە بریندار بوو.

لەساڵی ٨٦٠/٢٤٦ زایینی دانیشتووانی زۆربەی قەڵاکانی سیسیل پەیمانیان شکاند. ئەم قەڵایانە بریتی بوون لە: سەتر، ئەبێلە (ئاویلا) ئەبلاتنوا، قەڵای عەبد مۆئمین، بەلوت، قەڵای ئەبوسور و قەڵاکانی دیکە. عەباس هێرشی کردە سەریان و سوپاکەی ڕۆم ڕوبەڕوی بوویەوە. دوو سوپا جەنگیان دەستپێکرد و ڕۆمییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران.

عەباس بەرەو قەڵای عەبدمۆئمین و ئەبلاتنوا بەرێکەوت و گەمارۆی خستەسەر. ئاگادار بوویەوە کەسوپایەکی گەورەی ڕۆم لەرێگەوە گەیشتووە. عەباس بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ئەسپی غاردا و لەجفلودی لەنێوان دوو سوپا جەنگێکی ماڵوێرانکەر دەستپێکرد. دەرئەنجام ڕۆمییەکان شکستیان خوارد و بۆ ساراگوزا گەڕانەوە و عەباس گەڕایەوە بۆ قەسریانە وئاوەدانی کردەوە و سوپاییەکانی لەو شارەدا نیشتەجێ کرد.

لەساڵی ٨٦٣/٢٤٩ زایینی عەباس بەرەو ساراگوزا بەرێکەوت و تالآنی زۆری کۆکردەوە و دواتر ڕووی کردە ئەشکەوتەکانی قەرقنە بەلآم لەهەمان ڕۆژ نەخۆش کەوت و سێ ڕۆژ دواتر لەجومادی الاوەل/ سێ نۆڤەمبەر مرد و لەهەمان شوێن بەخاك سپێردرا. بەلآم ڕۆمییەکان گۆڕی ئەویان هەڵدایەوە و جەنازەکەیان سوتاند. ئەو بۆ ماوەی یانزە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و بەردەوام لەزستان و هاوین سەرقاڵی جەنگ بوو. ئەو شەڕی لەگەڵ خەڵکانی قەلوریە و ئەنکبەردە کرد و موسوڵمانانی لەوێ نیشتەجێ کرد.

دەسپێکی کاری یەعقوب کوڕی لەیس

لەم ساڵەدا پیاوێك لەخەڵکانی بوست بەناوی ساڵح کوڕی نەزری کەنانی دەستی بەسەر سیستاندا گرت. یەعقوب کوڕی لەیس هاوڕێی ئەو بوو. تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر فەرمانڕەوای خوراسان دووبارە سیستانی لەبوست سەندەوە.

دواتر پیاوێك دەستی بەسەر سیستاندا گرت. ئەویان بەدرهەم کوڕی حسەین ناو دەبرد و لەهێزە پێشەنگەکان بوو. ئەو نەیتوانی بارودۆخی سوپاکەی سەقامیگر بکات. یەعقوب کوڕی لەیس فەرماندەی سوپاکەی ئەو بوو. کاتێك موسوڵمانان ناتەوانی درهەم کوڕی حسەینیان بینی، بڕیاریاندا یەعقوب کوڕی لەیس وەك فەرماندە هەڵبژێرن و جڵەوی کارەکانی خۆیان بەو بسپێرن چوونکە ئەویان بەبەڕێوبەرێکی شیاو و بەتوانا دەزانی. کاتێك درهەم لەمەبەستی سوپاکە ئاگادار بوویەوە، ناسازگاری نەکرد و کاروبارەکانی بەیەعقوب سپارد و خۆی لەکار کێشایەوە. یەعقوب جڵەوی کاروباری گرتەدەست و پێگەی بەرز بوویەوە و سوپاییەکان لەهەموو ناوچەکانەوە پەیوەستی بوون. بەسەرهاتی ئەو دواتر ئاماژەی پێدەدرێت.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عوبەیداللە کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم فەرمانڕەوایی بەغداد و ئامادەکارییەکانی دەوروبەری بەغدادی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر لەخوراسانەوە هات و وەرگرتنی باج و فەرماندەیی پاسەوانەکانی گرتەدەست. ئەم کارە لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ سێپتامبەر ڕوویدا. لەم ڕۆژگارەدا متوەکیل لەبەغداد ودەوروبەری عێراق خەلافەتی دەکرد و لەوێ مابوویەوە.

لەم ساڵەدا باوکی وەلید، محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئادی لەکاروباری ستەم لێکراوەکان دوور خستەوە و محەممەد کوڕی یەعقوب ناسراو بەباوکی ڕەبیعی لەجێگەی ئەو دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا متوەکیل فەرمانیدا جەنازەی بەدار هەڵواسراوی ئەحمەد کوڕی نەزری خوزاعی دابگرن و تەسلیم بەکەسەکانی بکەنەوە. جەنازەی ئەویان هێنایە بەغداد و لەوێ سەریان لەجەستەی جیا کردەوە و لاشەکەیان شۆرد و کفنیان کرد و دفنیان کرد. لەرێ و ڕەسمی بەخاك سپاردن بەرادەیەك خەڵك کۆبوویەوە کەنەتوانرا ژمارەیان بزانرێت. هەموان دەستیان لەتابوتەکەی دەدا

(وەك موفرك) متوەكيل كاتێك خەلافەتی گرتەدەست، رێگەی نەدا سەبارەت بەقورئان پرسيار لەخەڵكان بكرێت و ئەم فەرمانەی بۆ هەموو سەرزەمينەكان نووسی.

عەلی كوڕی يەحيای ئەرمەنی لەهاوينی ئەم ساڵەدا جەنگی و عەلی كوڕی عيسا كوڕی جەعفەر كوڕی مەنسور كارگوزاری مەككە، رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا پياوێك لەكەنارەكانی ئاندۆلۆس دەركەوت و خۆی بە پێغەمبەر لەقەڵەمدا و قورئانی بەدرۆ زانی و دەستەيەك ئاژاوەگێر شوێنی كەوتن. لەفەرمانەكانی ئەو رێگرتن لەكورت كردنەوەی موو و نينۆك بوو. كارگوزاری شار بانگی كرد. ئەويان برد. يەكەم وتەی بەكارگوزار ئەوە بوو كەپەيوەستی ببێت كارگوزار پێشنياری پەشيمان بوونەوە و تۆبەی پێكرد بەڵام رازی نەبوو. كارگوزار ئەوی كوشت.

لەم ساڵەدا سوپای موسوڵمانان مەبەستی سەرزەمينی ناباوەڕانيان كرد و لەنێوانيان شەڕێكی ماڵوێرانكەر روويدا و سەرئەنجام موسوڵمانان سەركەوتنيان بەدەست هێنا. ئەم جەنگە بەجەنگی سپيد بەناوبانگە و لەئاندۆلۆس جەنگێكی ناسراوە.

لەم ساڵەدا عەباس كوڕی وەليدی مەدينی لەبەسرە و عەبد ئەعلی كوڕی حيمادی نێرسی و عوبەيدالله كوڕی موعازی عەنبەری كۆچی دواييان كرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و هەشتی کۆچی ( ٨٥٢ زایینی )

### کردەوەکانی بوغا لەتفلیس

پێشتر وتمان بوغا ڕووی کردە تفلیس و گەمارۆی خستە سەر شارەکە. کاتێك بوغا ڕووی کردە ئەو دیارە، زیرەکی تورکی لەپێشەوە نارد و ئەو لەگەڵ سوپاکەی لەروباری کوڕ گوزەری کرد. کوڕ، ڕووبارێکی گەورە و تفلیس لەکەنارەکەی و سوغد بیل لەبەشی ڕۆژهەڵاتی جێگیر بوو. کاتێك زیرەك لەڕووبارەکە پەڕییەوە، لەناو گۆڕەپانی تفلیس ئوردووی لێدا. بوغا هەروەها باوکی عەباسی وارسی مەسیحی بۆ لای عەرەبەکان و ناعەرەبەکانی ئەرمەنستان ڕەوانە کرد. باوکی عەباس لەدەروازەی مەرفسەوە ڕۆشتە ناو تفلیس. لەم کاتەدا ئیسحاق کوڕی ئیسماعیل، موالی مناڵەکانی ئومەییە، هێرشی کردە سەر زیرەك و هەردوو سوپا لەناو گۆڕەپانی تفلیس ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. بوغا لەسەر تەپۆڵەکەیەك وەستا بوو و سەیری جەنگی زیرەك و باوکی عەباسی دەکرد. بوغا نەوت هەڵگرەکانی بانگ کرد و فەرمانی پێدان شارەکە ئاگرباران بکەن. شارەکەیان ئاگرباران کرد و تفلیسیان کە بەشی زۆری لەداری سنەوبەر دروست کرابوو، سوتاند.

ئیسحاق کوڕی ئیسماعیل هاتە ناو شارەکە و بینی کۆشك و ژن و کەنیزەکانی بوونەتە خۆراکی ئاگر، تا هاتە خۆی، ئاگری گرت. سەربازە تورکی و مەغربییەکان (لەئەفریقاوە بۆ عێراق هێنرابوون) ئیسحاق و کوڕە مامەکەیان ئەسیر کرد و بردیانە لای بوغا. بوغا فەرمانی کوشتنی ئیسحاقی دەرکرد و جەنازەی ئەویان لای ڕووباری کوڕ هەڵواسی. ئەو پیرەپیاوێکی ئێسقان پان بوو، سەری گەورە و چاوەکانی خێل بوو. لەئاگرکەوتنەوەی شارەکە نزیکەی پەنجا هەزار کەس سووتان و ئەوەی لەدەست ئاگر رزگاری بوو، ئەسیر کرا. جل و بەرگی مردووەکانیشیان تالاَ کرد. کەسەکانی ئیسحاق سامانی ئەویان بۆ شاری سوغدبیل برد. سوغدبیل شارێك بوو بەهێز کەچواردەوری گیرا بوو و کەسرا ئەنەوشیروان دروستی کردبوو. ئیسحاق چواردەوری شارکەی گرت و سامان و ژنەکانی لەوێ کۆکردەوە. ژنەکەی کچی پاشای سەریر بوو.

بوغا، زیرەکی لەگەڵ سوپایەك بۆ قەڵای حەرزمان کە لەنێوان بەرزەعە و تفلیس بوو، ڕەوانە کرد و ئەو، دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت و سوپاسالارەکەی ئەسیر کرد. بوغا بەرەو لای عیسا کوڕی یوسف ئەسپی ناردا کە لەقەڵای کوبەیش

لەئاوەدانییەکانی بیلقان (ئەگەری هەیە باڵکان بێت) بوو. بوغا دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرت و عیسا کوڕی یوسفی لەگەڵ خۆی هێنا و باوکی عەباسی وەرائی کەناوی سەنبات کوڕی ئەشوتە، کردە هاوڕێی بەهەمان شێوە کەمعاویە کوڕی سەهل کوڕی سەنباتی لەرێگەی ئەرانەوە برد.

## هێرشی رۆمییەکان بۆ میسر

لەم ساڵەدا سێسەد کەشتی رۆمی لەگەڵ سێ فەرماندە پێشڕەوییان کرد. یەکێك لەفەرماندەکان لەگەڵ سەد کەشتی خۆی گەیاندە دەمیات. لەدەمیات تا کەنار، هاوشێوەی زەریاچەیەك بوو کەئاوەکەی تا سینەی پیاوێك بەرز دەبوویەوە و هەرکەس لەوێوە خۆی دەگەیاندە بەستێن، لەزیانی کەشتییەکان رزگاری دەبوو. دەستەیەك لەم شوێنەوە هاتن بێ ئەوەی زیانیان پێ بگات بەڵام ژمارەیەکی زۆر لەژن و مناڵەکان لەناو ئاودا مانەوە. هەرکەس توانای بوو خۆی گەیاندە میسر.

لەو کاتەدا عەنبەسە کوڕی ئیسحاقی زەببی سەرپەرەستی خواردەمەنی و توێشوی میسر بوو. کاتێك جەژن نزیك کەوتەوە، عەنبەسە فەرمانی بەسوپاکەی دەمیاتدا بڕۆنە ناو میسر و کاتێك ئەوان گەیشتنە ناو میسر، رۆمییەکان گەیشتن و بینیان دەمیات سوپای تیا نییە. ئەو ناوچەیان تاڵان کرد و شارەکەیان سوتاند و خەڵکەکەیان ئەسیر کرد و مزگەوتی هەینییان گرتێبەردا و کەرەستەکانی جەنگ و کاڵاکان و شەکر (لەمیسر بەناوبانگ بوو) و شتەکانی دیکەیان هەڵگرت. نزیکەی شەشسەد ژنی موسوڵمان و ناموسوڵمانیان گرت و کەشتییەکانی خۆیان پڕ کرد.

بوسر کوڕی ئەکشەف بەفەرمانی عەنبەسە لەدەمیات زیندانی کرابوو، خۆی ئازاد کرد و شەڕی لەگەڵ رۆمییەکان دەست پێکرد. دەستەیەك شوێنی کەوت و خوێنی ژمارەیەك لەسەربازە ڕۆمییەکانیان ڕشت. رۆمییەکان روویان کردە ئەشنوم تنیس. ئەم شارە دیوار و دوو دەرگای ئاسنینی بۆ دانرا بوو کەلەسەر فەرمانی موعتەسەم دروست کرابوو. رۆمییەکان کەرەستەکانی جەنگی ئەم شارە و دەرگا ئاسنینەکانیان ڕفاند و بێ ئەوەی رووبەرووی بەرگری ببنەوە، گەڕانەوە.

## مەرگی عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم و فەرمانڕەوای محەممەدی کوڕی

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم کوڕی هوشام کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی معاویە کوڕی هوشامی ئومەوی، پاشای ئاندۆلۆس لەمانگی رەبیع الاخر/

سێپتامبەر مرد. ١٧٦/ ٧٩٢ زایینی ساڵی لەدایك بوونی ئەوە و بۆ ماوەی سی و یەك ساڵ و سێ مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد.

عەبدولرەحمان ئەسمەر، باڵابەرز،لووتی قنج و کێشرا، چاوی ڕەش و ریشی پڕ بوو کەبەردەوام بەخەنە رەنگی دەکرد. چل و پێنج کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت. ئەدیب و شاعیر بوو. یەکێك بوو لەو کەسانەی کەنیزەکانی خۆش دەویست ( یا لەو کەسانە بوو کەکەنیزەکانی عاشقی بوون) ئەو عاشقی کەنیزێك بەناوی تەروب بوو. ئەم عەشقە ناودارە. شارەزایی زانستە دینی و فەلسەفییەکان بوو. لەرۆژگاری ئەو ئاسایش و ئارامی باڵی بەسەر سنوری فەرمانڕەوایەتییەکەیدا کێشا. سامانی زۆر، چالاك بوو، چەندین کۆشك و سەیرانگاە و رێگەی فراوانی دروست کرد و دوو ئەیوانی بەمزگەوتی گەورەی کوردوبا زیاد کرد بەڵام پێش ئەوەی بتوانێت رازاندنەوەی مزگەوتەکە تەواو بکات، ژیانی کۆتایی پێهات و کوڕەکەی کارەکەی تەواو کرد و چەندین مزگەوتی دیکەی لەئاندۆلۆس دروست کرد.

کاتێك عەبدولرەحمان مرد، محەممەدی کوڕی جێگەی گرتەوە و لەدادپەروەری رێگەی باوکی گرتەبەر و کاری دروست کردنی مزگەوتی هەینی کوردوبای بەئەنجام گەیاند. دایکی ئەو بەبێهتەر ناودەبرا و بۆ عەبدولرەحمان سەد منالی هێنایە دنیا. ئەو یەکەم کەس بوو کە لەئاندۆلۆس پێگەی فەرمانڕەوایی بەرز کردەوە و کاروباری وڵات بەرێوەبردنی رێکخست. عەبدولرەحمان یەکەم کەس بوو ئاوی شیرینی بردە کوردوبا وبۆ پاڵاوتنی ئاوەکە پاڵاوگەیەکی گەورەی دروست کرد کەخەڵکان ئاوی شیرینیان لێ هەڵدەگرت.

**بیرکردنەوەی چەند رووداوێك**

لەم ساڵەدا متوەکیل رووی کردە مەدائین و هاتە بەغداد و لەوێوە ڕۆشتە مەدائین. یەحیای ئەرمەنی لەهاوینی ئەم ساڵدا جەنگی کرد.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی حەنزەلی ناسراو بەکوڕی راهویە کەپێشەوایەکی زانا بوو و لەگەڵ شافعی گفتوگۆمانی دەکرد، لەتەمەنی حەفتا ساڵی مرد.

محەممەد کوڕی بوکاری موحەدیس لەم ساڵەدا مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و سی و نۆی کۆچی (٨٥٣ زایینی)

لەم ساڵەدا متوەکیل فەرمانیدا ناموسوڵمانان ناچار بکەن دوو کراسی هەنگوینی ڕەنگ لەسەر عابا و جلەکانی خۆیان بپۆشن و تەنیا سواری ئێستر و کەر بن و مۆڵەتی سوار بوونی ئەسپ و مایینیان نییە.

هەروەها لەم ساڵەدا متوەکیل، عەلی جوهمی بۆ خوراسان دوور خستەوە.

لەم ساڵەدا متوەکیل فەرمانیدا پەرەسگاکانی یەهودی و مەسیحی کە لەرۆژگاری ئیسلام دروست کرابوون، وێران بکەن.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان سوپایەکی بەفەرماندەیی حەکەمی برای بۆ قەڵای ڕەباح ڕەوانە کرد. خەڵکانی تۆلدۆ پێشتر دیوارەکەیان وێران و ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکەیان کوشتبوو. حەکەم سەر لەنوێ دیوارەکەی نۆژەن کردەوە و خەڵکانی بۆ شارەکە گەڕاندەوە و بارودۆخەکەی سەقامگیر کرد و خۆی هێرشی کردە سەر تۆلدۆ و هەموو ناوچەکانی وێران کرد. محەممەد سوپایەکی دیکەی بۆ تۆلدۆ ڕەوانە کرد بەڵام کاتێك سوپاکە لەشارەکە نزیك کەوتەوە، دوژمنان لەکەمینگاکانی خۆیان هاتنەدەر و سوپای موسوڵمانانیان پەرێشان کرد و زۆربەی موسوڵمانان بریندار بوون.

لەم ساڵەدا باوکی وەلید، محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد، قازی قازییەکانی بەغداد، لەزیحەججە/ مەی کۆچی دوایی کرد.

عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی لەهاوینی ئەم ساڵدا شەڕی کرد.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی دینار کارگوزاری ڕێگەی مەککە و حەج، بەرەو ماڵی خوا بەرێکەوت. عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی داود کوڕی عیسا کوڕی موسا، کارگوزاری مەککە، لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا جەژنی شەعانینی مەسیحییەکان و نەورۆز لەیەك رۆژدا بوو و ئەو رۆژە یەکشەممە بیستی زیقەعدە/ دووشەممە بیست و سێی ئاوریل بوو. مەسیحییەکان دەیانوت هیچ کات لەئیسلامدا ئەم دوو جەژنە لەیەك رۆژدا کۆنەبوونەتەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی غەیلانی مەروزی باوکی ئەحمەد لەمامۆستاکانی بوخاری و موسلیم و تەرموزی، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و چلی كۆچی ( ٨٥٤ زایینی )

### شۆڕشی حیمسییەكان

لەم ساڵەدا خەڵكانی حیمس دژی كارگوزارەكەی خۆیان باوكی موغیس موسا كوڕی ئیبراهیمی رافعی شۆڕشیان كرد. ئەو یەكێك لەسەركردەكانی ئەوانی كوشتبوو. خەڵكیش دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەویان كوشت و ئەویان لەشارەكە دەرپەڕاند. ئەوان لێپرسراوی خەراجی ئەویان لەشارەكە دەركرد. متوەكیل، عیتاب كوڕی عیتاب و محەممەد كوڕی عەبدویەی ئەنباری بۆ لەناوبردنی ئەوان ڕەوانە كرد و بەعیتابی وت: پێیان بڵێ سەروەری باوەڕداران كارگوزارێكی دیكەی بۆ ئێوە ڕەوانە كردووە، ئەگەر گوێڕایەڵ بوون، محەممەد كوڕی عەبدویە وەك كارگوزاری ئەوان دیاری بكە و ئەگەر گوێڕایەڵ نەبوون، لەوێ بمێنەرەوە و ئاگادارم بكە تا پیاوان و شاسوارەكان بۆ هاوكاری تۆ بنێرم.

نێردراوەكانی متوەكیل بۆلای خەڵكانی حیمس ڕۆشتن و لەرەبیع الاخر/ ئۆگۆست گەیشتنە لای ئەوان. خەڵكان بەكارگوزاری محەممەد كوڕی عەبدویە، رازی و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. ئەو لەناو خەڵكانی حیمس دیاردەی سەیر وسەمەری هێنایە ئاراوە بەشێوەیەك ئەوانی دژی خۆی هاندا كە بەخواستی خوا ئاماژەی پێ دەدەین.

## جەنگی موسوڵمانان و فەرەنگەكان لەئاندۆلۆس

لەموحەرەم/ ژوئەنی ئەم ساڵە لەنێوان موسوڵمانان و فەرەنگەكان لەئاندۆلۆس جەنگێكی قورس ڕوویدا. هۆكارەكەی ئەوە بوو خەڵكانی تۆلدۆ –وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا– لەگەڵ محەممەد كوڕی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس و باوكی ئەو ناسازگار بوون. لەم كاتەدا محەممەد لەگەڵ سوپاكەی بەرەو تۆلدۆ بەرێكەوت. كاتێك خەڵكانی تۆلدۆ لەمەبەستی ئەوان ئاگادار بوونەوە، پەیكیان بۆ لای فەرمانڕەوای جەلیقییە و فەرمانڕەوای بەشكەنس نارد و داوای هاوكارییان كرد. ئەوان بەسوپایەكی گەورە هاوكاری خەڵكانی تۆلدۆیان كرد.

کاتێك محەممەد لەڕەوانە کردنی سوپای هاوکاری ئەوان ئاگادار بوویەوە – لەم کاتەدا لەتۆلدۆ نزیك ببوویەوە– سوپاکەی کۆکردەوە و بۆ ئەوان لەوادی سەلیت چەندین کەمینگای هەڵکەند و لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەسوپاکەی هێرشی کردە سەر خەڵکانی تۆلدۆ. کاتێك خەڵکانی تۆلدۆ ئەوانیان بینی، فەرەنگەکانیان لەکەمی ژمارەی ئەوان ئاگادار کردەوە و بۆ جەنگی ئەوان ڕۆشتن و چاوی تەماحیان تێبڕین. کاتێك دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕ قورس بوو، ئەوانەی کەمینیان کردبوو لەهەر سووچێکەوە هێرشیان کردە سەر دوژمنان و فەرەنگەکان و بەئەندازەیەك لەوانیان کوشت کە لەژماردن نایەت. هەشت هەزار کەسیان سەر بڕی و سەری ئەوانیان بەناو شارەکاندا سوڕاند. خەڵکانی تۆلدۆ ژمارەی کوژراوەکانیان بەبیست هەزار کەس دەزانی. جەنازەی کوژراوەکان بۆ ماوەیەکی درێژ لەوادی سەلیت مایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی ئەکسەم لەپێگەکەی دوورخرایەوە. حەفتا و پێنج هەزار دینار و چوار هەزار جەریب زەوییان لێسەند.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی عەبدواحید کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمان کوڕی عەلی وەك قازی قازییەکان دەستنیشان کرا و عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی داود لەم ساڵەدا، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. جەعفەر کوڕی دینار فەرماندەی کارەساتەکان و ڕووداوەکانی حەج بوو.

هەروەها لەموحەرەم/ ژوئەنی ئەم ساڵە باوکی عەبدوللە ئەحمەد کوڕی باوکی دۆئاد، بیست ڕۆژ دوای مەرگی کوڕەکەی باوکی وەلید، مرد. ئەو باوەڕی بەئافرێنراو بوونی قورئان و باوەڕەکانی موعتەزیلە هەبوو. ئەم ئایینەی لەبیشر کوڕی مەریسی وەرگرت و بیشر لەجوهم کوڕی سەفوان و جوهم لەجەعد کوڕی ئەدهەم و جەعد لەئەبان کوڕی سەمعان و ئەبان لەتالوت، خوشکەزای لوبەید ئەعسەم و زاواکەی (زاوای ئەبان) ئەعسەم جولەکە بوو و پێغەمبەری بەجادوگەر دەزانی. لوبەید تەوراتیشی بەئافرێنراو دەزانی و یەکەم کەس کە لەمبارەوە شتی

نووسی تالوتی زەندیق بوو کەباوەڕەکەی خۆی بڵاو کردەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا قوتەیبە کوڕی سەعید کوڕی حومەید، باوکی رەجای سەقەفی لەتەمەنی نەوەد ساڵی کۆچی دوایی کرد. ئەو لەخەڵکانی خوراسان و لەمامۆستاکانی بوخاری و موسلیم و ئەحمەد کوڕی حەنبەل و پێشەواکانی دیکە بوو. باوکی سور ئیبراهیم کوڕی خالیدی بەغدادی کەلبی فەقیە، لەهاوەڵانی شافعی، باوکی عوسمان محەممەد کوڕی شافعی کەدادیاری جەزیرە بوو و حەدیسی لەباوکی و عەنبەسە دەگێرایەوە کۆچی دواییان کرد. دەستەیەك مەرگی باوکی عوسمان بۆ ساڵی ٨٥٤/٢٤٠ زایینی دەگێڕنەوە. شافعی مناڵێکی دیکەی بوو بەناوی محەممەد کە لەساڵی ٨٤٥/٢٣١ زایینی مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و یەکی کۆچی (٨٥٥ زایینی)

### شۆڕشی خەڵکانی حیمس

لەم ساڵەدا خەڵکانی حیمس دژی کارگوزارەکەی خۆیان محەممەد کوڕی عەبدویە شۆڕشیان کرد و دەستەیەك لەمەسیحییەکانی حیمس هاوکارییان کردن. محەممەد هەواڵی ئەم شۆڕشەی بۆ متوەکیل نووسی و ئەو فەرمانی ڕووبەڕوو بوونەوەی پێدا و بەسوپایەك لەدیمەشق و ڕەملە هاوکاری کرد. محەممەد سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دوو کەس لەسەرکردەکانی ئەوانی بەئەندازەیەك ئەشکەنجە کرد کەمردن و جەنازەی ئەوانی لەسەر دەروازەی حیمس هەڵواسی و هەشت کەسی دیکەی بۆ لای متوەکیل نارد و دواتر دە کەسی دیکە لەسەرکردەکانی ئەوانی گرت و خوێنی ڕشتن. متوەکیل فەرمانی پێدا مەسیحییەکان لەو شارە دەرپەڕێنێت و کەنیسەکانیان وێران بکات و کەنیسەکانی نزیك مزگەوتی هەینی پەیوەستی مزگەوتەکە بکات. محەممەد فەرمانەکانی ئەنجامدا.

### ئاڵ و گۆڕی ئەسیرە موسوڵمان و ڕۆمییەکان

لەم ساڵەدا ئەسیرە موسوڵمان و ڕۆمییەکانیان ئاڵوگۆڕ کرد. ئەمە لەدوای ئەوە بوو کەتەدروە شابانوی ڕۆم دوانزە هەزار ئەسیری موسوڵمانی کوشت. ئەو پێشنیاری باوەڕهێنان بەئایینی مەسیحی پێکرد. هەرکەس ڕازی دەبوو، ئەوی دەکرد نمونە بۆ ئەوانی دیکە و هەرکەس ڕازی نەدەبوو، دەیکوشت و بۆ ئەوانەی نەیدەکوشت، داوای خوێنبایی دەکرد. متوەکیل، شەنیفی خزمەتکاری بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ڕاسپارد و لەجەعفەر کوڕی عەبدواحید قازی قازییەکانی ویست ئامادەی ئەم ڕێ ورەسمە بێت وکەسێك بۆ کاروباری داوەری لەجیاتی خۆی دابنێت. ئەو ڕازی بوو و کوڕی باوکی شەواربی لەجێگەی خۆی دانا کەهێشتا گەنج بوو. کاری گۆڕینەوەی ئەسیرەکان لەکەنار ڕووباری لامس ئەنجامدرا. ژمارەی ئەسیرە موسوڵمانەکان حەوتسەد و هەشتا و پێنج و ژمارەی ژنەکان سەد و بیست

و پێنج کەس بوو.

لەم ساڵەدا متوەکیل بۆ هەرکام لەئاوەدانییەکانی شەمشات ماڵیاتی دەیەکی دانا. ئەم ئاوەدانییانە پێشتر خەراجیان دەدا.

## هێرشی بیجات بۆ میسر

لەم ساڵەدا بیجات (کۆی بیجە، خەڵکانی بیابان نشینی ئەفریقا) هێرشیان کردە سەر میسر. ئەم نەتەوە پێشتر بەپێی ئاگربڕێکی کۆن هەرگیز هێرشیان نەدەکردە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان و ئێمە باسمان کرد. سەرزەمینی ئەوان پڕ بوو لەکانەکان کەموسوڵمانان دەریاندەهێنا وداهاتەکەیان لەگەڵ ئەوان دابەش دەکرد و ئەوان پێنج یەکی داهاتی خۆیان تەسلیم بەحکومەتی ئیسلامی دەکرد.

کاتێك متوەکیل لەسەر تەخت دانیشت، ئەوان بەدانی ئەم برە پارە رازی نەبوون. سەرپەرەستی بەریدی میسر هەواڵی ئەم کارەی نووسی و متوەکیلی ئاگادار کردەوە کەئەوان چەند کەس لەکرێکارە موسوڵمانەکانیان کوشتووە و موسوڵمانان لەترسی ئەوان هەڵاتوون. متوەکیل ئەم کردەوەی پەسەند نەکرد و سەبارەت بەوان لەگەڵ کەسە نزیکەکان راوێژی کرد. پێیان وت: ئەوان بیابان نشینن و وشتر و چوارپێ پەروەردە دەکەن. گەیشتن بەسەرزەمینی ئەوان دژوار و کارێکی بیرمەندانە نییە. دووری سەرزەمینە ئیسلامییەکان و ئەو ناوچە یەك مانگ رێگە لەدەشتە وشك و کوێستانە دژوارەکانە. هەر سوپایەك دەڕۆشتە ئەو سەرزەمینە، بەرادەیەك پێویستیان بەخواردن دەبوو گومانیان دەکرد تا گەڕانەوەی بۆ سەرزەمینە ئیسلامییەکان لەوێ دەمێننەوە و ئەگر ئەم کاتە درێژەی بکێشایە، هەمووان لەنەبوونی خواردەمەنی گیانیان دەدا یا گرفتاری بیجات دەبوون. لەلایەکی یکە گرتنی سەرزەمینەکانی ئەوان هیچ سوودێکی بەموسوڵمانان نەدەگەیاند.

لەبەر ئەمە متوەکیل ئەوانی پشتگوێ خست بەڵام ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەوان چاوی تەماح ببڕنە سەرزەمینە ئیسلامییەکان و خراپەکاری بکەنە پیشە تا ئەو جێگەی خەڵکانی سەعید( سەرەوەی میسر) ترسی ئەوانیان لێ نیشت. متوەکیل، ناچار محەممەد کوڕی عەبدوللەی قومی بۆ جەنگی ئەوان نارد و خەراجی ئەو

سەرزەمینانەی بەو سپارد. ئەم ئاوەدانییانە بریتی بوون لە: قوفت، ئوقسور، ئەنسا، ئەرمەنت، ئوسان. فەرمانی پێدان لەگەڵ نەتەوەی بیجە بجەنگێت. متوەکیل نامەیەکی بۆ عەنبەسە کوڕی ئیسحاقی زەببی سوپاسالاری میسر نووسی و فەرمانی پێدا ڕێگە بۆ عەبدوللە بکاتەوە و هەرچەندە سەربازی ویست، بیخاتە بەردەستی. عەنبەسە فەرمانەکەی جێبەجێ کرد.

محەممەد ڕێگەی سەرزەمینی بیجاتی گرتەبەر و ژمارەیەکی زۆر لەکرێکاری کانەکان و هێزە پێشەنگەکان هاورێییەتیان دەکرد تا ئەوەی ژمارەی سوپاکەی بۆ بیست هەزار سوار و پیادە زیادی کرد. ئەو پەیکی بۆ قولزوم نارد و حەوت کەشتی ڕەوانەی دەریا کرد پڕ لەئارد، ڕۆن، خورما، جۆ و سوەیق (خواردنێك کە لەئارد، شیر و خواردەمەنییەکانی دیکە دروست دەبوو) فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا تا کەنارەکان کەنزیك لەسەرزەمینی بیجات بوو، لەگەڵ کەشتییەکاندا بڕۆن.

محەممەد پێشڕەوی کرد و لەکانە زێڕەکان گوزەری کرد و رووی کردە قەڵاکانی ئەوان. لەم کاتەدا فەرمانڕەوای ئەوان بەناوی عەلی بابا لەگەڵ سوپایەك هاتەدەر چەند بەرابەر سوپاکەی محەممەد. نەتەوەی بیجات سوار وشترانێك بوون هاوشێوەی وشترە ڕەسەنەکان. دوو لای سوپا چەند رۆژێکیان بەجەنگەوە بەسەر برد. عەلی بابا بەشێوەی پێویست نەدەجەنگی بۆ ئەوەی رۆژەکان بەسەر بچێت و خواردن و ئالفی موسوڵمانان کۆتایی پێبێت و بەمشێوەیە بێ جەنگ، گرفتاریان بکات. لەم کاتەدا کەشتییەکانی هەڵگری خواردەمەنی گەیشتن و قومی، توێشو و خواردنی لەناو سوپاکەی دابەش کرد.

کاتێك عەلی بابا ئەمەی بینی، مەبەستی ئەوەی کرد رووبەروویان ببێتەوە. ئەو هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و دوو سوپا جەنگیان دەستپێکرد جەنگێکی ماڵوێرانکەر. وشترەکانی نەتەوەی بیجات ترسەنۆك بوون و لەهەر دەنگێك دەترسان. کاتێك قومی ئەمەی بینی، هەموو زەنگۆڵەکانی سوپاکەی کۆکردەوە و بەملی ئەسپەکانەوە هەڵیواسی و هێرشی کردە سەر بیجات. وشترەکان بەبیستنی دەنگی زەنگۆڵەکان ڕەمیان کرد و سوارەکانی خۆیان بەرەو کێو و بیابانەکان برد. موسوڵمانان شوێنیان دەکەوتن و دەیانکوشتن یا ئەسیریان دەکردن تا ئەوەی شەو

باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشا. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٨٥٥/٢٤١ زایینی روویدا. عەبدوللە بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە و کەس نەیدەتوانی کوژراوەکان بژمێرێت.

دواتر پاشاکەیان عەلی بابا داوای ئەمانی کرد و محەممەد بەو مەرجە ئەمانی پێدا کەسەرزەمینەکەی خۆی رادەستی موسوڵمانان بکات و خەراجی چوار ساڵ کەنەیدابوو، بدات. ئەو لەگەڵ عەبدوللە بۆ لای متوەکیل بەرێکەوت و بوغی کوڕی وەك جێگری خۆی دانا. کاتێك گەیشتە لای متوەکیل، متوەکیل رێزی لەخۆی و هاوەڵانی گرت و دیاری پێبەخشین. متوەکیل پارێزگاری کردنی رێگەی میسر تا مەککەی بەخەڵکی بیجات سپارد و فەرماندەیی ئەوانی بەسەعدی ئیتاخی سپارد. ئیتاخی بەنوێنەرایەتی خۆی محەممەدی قومی وەك فەرماندە دەستنیشان کرد.

محەممەدی قومی بۆ ئەو سەرزەمینە گەڕایەوە و عەلی بابای لەگەڵ خۆی برد. عەلی بابا بتێکی پێبوو کە لەبەرد داتاشرابوو. بەردەوام سەری لێ دەسوو (سەیرە کەعەلی ناوی موسوڵمانانە)

**بیرکردنەوەی چەند رووداوێك**

لەم ساڵەدا لەمانگی ئاب، بارانێکی توند لەسامەرا دەستی پێکرد.

لەم ساڵەدا متوەکیل ئاگادار بوویەوە کەعیسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عاسم، خاوەنی کاروانسەراکانی عاسم لەبەغداد، جوێن بەئەبوبەکر، عومەر، عایشە و حەفسە دەدات. متوەکیل فەرمانێکی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر نووسی تا بیخاتە ژێر بارانی قامچی تا ئەو کاتەی گیانی دەردەچێت و جەنازەکەی فڕیداتە ناو دیجلە. محەممەد ئەو کارەی کرد و جەنازەی بێ گیانی ئەوی فڕدایە ناو رووباری دیجلە.

لەم ساڵەدا چوارپێکان گرفتاری نەخۆشییەك بوون کەبەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لەچوارپێ و مانگاکان مردن.

لەم ساڵەدا رۆمییەکان لەعەین زەربە تاڵانییان کردە پیشە و زوتییەکانیان لەگەڵ ژن و منداڵ و چوارپێکانیان گرت.

لەم ساڵەدا محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، ژمارەی سەربازەکانی قەلأی ڕەباح و کەنارەکانی زیاد کرد تا چاودێری خەڵکانی تۆلدۆ بکات. ئەو سوپایەکی بەفەرماندەیی موسا بۆ جەنگی فەرەنگەکان نارد. سوپاکەی موسا ڕۆشتە سەرزەمینی فەرەنگەکان و گەیشتنە قەلآکانی ئەلبە و قەلآکانی دیکە. دەستەیەك لەقەلآکانیان گرت و گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی ئیبراهیم، سەرپەرەستی بەریدی میسر و ڕۆژئاوا کە بەقەوسەرە بەناوبانگ بوو، مرد. عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی داود ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. جەعفەر کوڕی دینار، کەپارێزەری ڕێگە و ڕووداوەکانی حەج بوو، سەردانی ماڵی خوای کرد.

لەم ساڵەدا کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەکان [٢٠] بەرادەیەك زیادی کرد لەژماردن نەدەهات و بارینی ئەوان تا بەرەبەیان بەردەوام دەبوو.

لەم ساڵەدا ئەرد هەژێنێکی گەورە شاری ڕەی لەراندەوە و ماڵەکان وێران و خەڵکانی زۆر لەژێر دارو پەردووی ماڵەکان گیانیاندا. ئەم ئەرد هەژێنە بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەردەوام بوو.

لەم ساڵەدا لەتورکستان گەردەلوولێك هەڵیکرد و ژمارەیەکی زۆری کوشت و ژمارەیەك لەسەرماکەی توشی پەتا دەبوون. ئەم گەردەلولە سەرەخس، نەیشابور، هەمەدان و ڕەی گرتەوە و لەحولوان کۆتایی پێهات.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی حەنبەلی شەیبانی، فەقیە و حەدیس بێژ، لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ ژوئیە، مرد.

[٢٠] مەبەستی نوسەر بەردە ئاسمانییەکانە (وەرگێر)

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و دووی کۆچی ( ٨٥٦ زایینی )

لەشەعبان/ دێسامبەری ئەم ساڵە چەندین ئەرد هەژێنی مەترسیدار لەقومس و ئاوەدانییەکانی ئەو سەرزەمینە ڕوویدا و بەهۆیەوە ماڵەکان وێران بوون و ژمارەیەکی زۆر لەژێر داروپەردوی خانەکان گیانیان سپارد. دەستەیەك ژمارەی کوژراوەکان بەچل و پێنج هەزار و نەوەد و شەش کەس دەخەملێنن. زۆرینەی کوژراوەکان لەخەڵکانی دامەغان بوون. لەم ساڵەدا لەشام، فارس و خوراسانیش چەندین ئەردهەژێنی مەترسیدار ڕوویاندا و لەیەمەنیش ئەرد هەژێن ژمارەیەکی زۆری کوشت.

لەم ساڵەدا دوای گەڕانەوەی عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی لەجەنگی هاوینە، ڕۆمییەکان لەلای سەمەیساتەوە شۆڕشیان کرد و خۆیان لەئامەد نزیك کردەوە، دواتر لەسنوورەکانی جەزیرەوە هاتن و چەند گوندێکیان تاڵان کرد و نزیکەی دە هەزار کەسیان ئەسیر کرد. ئەوان لەکەنارەکانی ئەرین[21] یەکێك لەگوندەکانی قەریباس دەرکەوتن. قەریباس و عومەر کوڕی عەبدوڵلەی ئەقەتەع لەگەڵ دەستەیەك لەخۆبەخشەکان شوێنیان کەوتن بەڵام پێیان نەگەیشتنەوە. متوەکیل فەرمانی بۆ عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی نووسی تا لەزستاندا هێرشیان بکاتەسەر.

هەروەها لەم ساڵەدا متوەکیل، عەتاری کوشت. ئەو پێشتر مەسیحی بوو بەڵام باوەڕی بەئایینی ئیسلام هێنا و چەندین ساڵ لەسەر ئایینەکەی مایەوە، دواتر ئیسلامی پشتگوێ خست و دووبارە باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا. پێشنیاری تۆبەی پێکرا بەڵام ڕازی نەبوو. ئەویان کوشت و جەستەیان سووتاند.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان لەئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ سەرزەمینی ناباوەڕان ڕەوانە کرد. ئەوان ڕۆشتنە بارسەلۆنا و دەستیان بەسەر چەندین قەڵادا گرت و تا دەوروبەری ئەم شارە پێشڕەوییان کرد و تاڵانی زۆریان کۆکردەوە و لەنزیك بارسەلۆنا قەڵایەکیان داگیر کرد بەناوی تەراجە کە بەدوایین

---

[21] لەمێژووی تەبەری بەئیبریق هاتووە. (وەرگێڕ)

قەڵای بارسەلۆنا هەژمار دەکرا.

لەدەی موحەرەم/ بیستی مەی ئەم ساڵە، باوکی عەباس محەممەد کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی مرد و دوای ئەو کوڕەکەی باوکی ئیبراهیم ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەغلەب جێگەی باوکی گرتەوە. ئێمە پێشتر ئاماژەمان بەچۆنیەتی ئەم بابەتە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٨٤٠/٢٢٦ زایینی باس کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی حەسانی زیادی، دادیاریَ بەشی ڕۆژهەڵاتی بەغداد و حەسەن کوڕی عەلی کوڕی جوعد دادیازی شاری مەنسور، مردن.

لەم ساڵەدا عەبدسەمەد کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ئیمام، کارگوزاری مەککە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. جەعفەر کوڕی دینار کەفەرماندەی پاسەوانەکانی ڕێگەی مەککە بوو، لەم ساڵەدا حەجی کرد.

لەم ساڵەدا قازی، یەحیا کوڕی ئەکسەمی تەمیمی لەکاتی گەڕانەوە لەحەج لەرەبزە و محەممەد کوڕی موقاتیلی رازی و باوکی حوسێن یەحیا کوڕی سەلیمی رازی حەدیس بێژ، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و سێی کۆچی ( ٨٥٧ زایینی )

لەزیقەعدە/ فەوریەی ئەم ساڵە، متوەکیل لەڕێگەی موسڵەوە بەرەو دیمەشق ڕۆشت و لەبەلەد چواریێیەکی سەربڕی. یەزید کوڕی محەممەدی موهەلبی ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

اظن الشام تشمت بالعراق — اذا عزم الامام على انطلاق

فان يدع العراق و ساكنيه — فقد تبلى المليحة بالطلاق

واتاکەی: گومان دەکەم شام سەرکۆنە لەعێراق دەدات، چوونکە ئیمامە مەبەستی سەفەری کردووە. ئەگەر پێشەوا، عێراق و خەڵکەکەی بەجێبێڵێت هاوشێوەی ئەوەیە کەژنێکی نمەك کردوو گرفتاری تەڵاق بووبێت.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی سەوڵی سەوڵی وتاردەر و شاعیر، کۆچی دوایی کرد. بەڕێوەبردنی دیوانی زەوییەکان و ئاوەدانییەکان، حەسەن کوڕی موخەلید کوڕی جەراح، جێگری ئیبراهیم گرتییە ئەستۆ.

لەم ساڵەدا عاسم کوڕی مەنجور مرد و عەبدسەمەد کوڕی موسا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. جەعفەر کوڕی دینار فەرماندەی پاسەوانەکانی ڕێگە و ڕووداوەکانی حەج، لەم ساڵەدا حەجی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا هەموو خەڵکانی تۆلدۆ مەبەستی تەلبیرە (تالاورا)یان کرد. پاشای ئەم شارە مەسعود کوڕی عەبدوڵڵەی عەریف بوو کە لەگەڵ سوپاکەی خۆی ڕووبەڕووی سوپاکەی تۆلدۆ بوویەوە و شەڕی لەگەڵ کردن و سەرئەنجام سوپاکەی تۆلدۆ شکستی خوارد و زۆربەیان کوژران و حەوتسەد سەر بۆ کوردوبا برا.

هەروەها لەم ساڵەدا سوهەید کوڕی عیسا کوڕی سوهەیدی ئەندۆلۆسی لەفرەزانەکان مرد.

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی یوسف ناسراو بەناوی کوڕی سەکیت، مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بە٨٥٤/٢٤٠ زایینی و دەستەیەك بە٨٦٤/٢٥٠ زایینی و دەستەیەك بە ٨٦٠/٢٤٦ زایینی دەزانن.

لەم ساڵەدا حارس کوڕی ئەسەدی موحاسبی باوکی عەبدوڵڵەی زاهید کەئیمام ئەحمەدی حەنبەل بەهۆی باوەڕەکانیەوە ڕزگاری کردبوو، کۆچی دوایی کرد. تەنیا چوار کەس لەسەر جەنازەکەی ئەو نوێژیان خوێند.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و چواری کۆچی ( ٨٥٨ زایینی )

لەمانگی سەفەر/ مەی ئەم ساڵە متوەکیل هاتە دیمەشق و مەبەستی مانەوە لەوشارەی کرد. دەبیرخانەکانی هێنایە ئەم سەرزەمینە و فەرمانی دروست کردنی بیناکانی دەرکرد. بەڵام ئەم شارە نەخۆشی لێکەوتەوە چوونکە هەواکەی سارد و تەڕ و ئاوەکەی قورس بوو. بەردەوام دوای نیمەڕۆ با هەڵیدەکرد و تا کۆتایی شەو توندییەکەی زیادی دەکرد. ئەم شارە پڕ بوو لەئەسپێ، بەهای کاڵاکان گران و سەهۆڵبەندان ڕێگەی لەگەیشتنی خواردەمەنی بۆ ناو شارەکە دەگرت. لەبەر ئەمە متوەکیل بۆ سامەرا گەڕایەوە و دوو مانگ و چەند ڕۆژ لەدیمەشق مایەوە. لەوێوە بوغای بۆ جەنگی ڕۆمییەکان نارد. بوغا جەنگی هاوینەی کرد و دەستی بەسەر سەملەدا گرت.

لەم ساڵەدا متوەکیل، باوکی ساج، لەجیاتی جەعفەر کوڕی دینار وەك فەرمانڕەوای پاسەوانەکانی ڕێگەی مەککە دیاریکرد. دەستەیەك ئەم ڕووداوە بۆ ساڵی ٢٤٢/٨٥٦ زایینی دەگێڕنەوە کەئەمە ڕاستترە.

هەروەها لەم ساڵەدا ڕمی پێغەمبەریان بردە لای متوەکیل. ئەم ڕمە بەعەنەزە ناو دەبرا و هی نەجاشی بوو کەپێشکەش بەزوبەیر کوڕی عەوامی کردبوو و زوبەیریش پێشکەشی پێغەمبەری کرد. ئەمە ئەو ڕمە بوو کە لەجەژنی قوربان و ڕەمەزان لەبەردەم پێغەمبەر (د.خ) لەسەر زەوی دایان دەکوتا. فەرمانڕەوای پاسەوانەکان ئەم ڕمەی لەبەردەم متوەکیل دەخستە سەرشان.

لەم ساڵەدا متوەکیل لەبەختیشوع تووڕە بوو، دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت و بۆ بەحرەین دووری خستەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا جەژنی قوربان لەگەڵ جەژنی شەعانینی مەسیحییەکان و جەژنی ڕەمەزانی جولەکەکان کەوتە یەك ڕۆژەوە و عەبد سەمەد کوڕی موسا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی موسای ئەنساری و عەلی کوڕی حیجری سەعدی مەروزی کە هەردووك لەحەدیسدا پێشەوا بوون و محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی باوکی شەوارب و محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی باوکی عوسمان کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی خالید کوڕی ئەسید کوڕی باوکی عەیس کوڕی ئومەییەی قازی لەمانگی جومادی الاوەل/ ئوت کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و چل و پێنجی كۆچی ( ٨٥٩ زایینی )

لەم ساڵەدا متوەكیل فەرمانیدا ماخورە[٢٢] دروست بكەن. ئەم ئاوەدانییەی ناونا جەعفەرییە و لەوێ زەوی بەسەر سەركردەكان و هاوەڵانی دابەش كرد. ئەو بۆ دروست كردنی ئەم شارە هەوڵیدا و وەك دەڵێن زیاتر لەدوو هەزار هەزار دیناری بۆ خەرج كرد. لەوێ قورئان خوێنەكانی كۆكردەوە و قورئانیان خوێند، گۆرانیبێژەكانیشی بردە ئەو شارە و زیاتر لەدوو هەزار هەزار درهەمی پێ بەخشین. ئەو هاوەڵ و كەسە نزیكەكانی خۆی بەمتوەكلییە ناو برد، لەو شارە كۆشكێكی بەرز كردەوە بەناوی لۆلۆئاش. پێشتر كۆشكێكی بەو بەرزییە نەبینرابوو. بۆ ئەم كۆشكە رووبارێكی درێژ كردەوە كەدەوروبەری كۆشكەكەی تێراو دەكرد بەڵام دوای ئەو متوەكیل كوژرا، كاری تەواو كردنی ئەم رووبارە كۆتایی نەهات و جەعفەرییە وێران كرا.

لەم ساڵەدا ئەردهەژێن سەرزەمینەكانی رۆژئاوای هەژاند كە بەهۆیەوە چەندین قەڵا و خانوو و پردەكان وێران بوون. متوەكیل سێ هەزار هەزار درهەمی بۆ زیان لێكەوتووان ڕەوانە كرد. ئوردووگای مەهدی و مەدائینیش لەرییەوە. لەئەنتاكەییەیش ئەردهەژێن روویدا و بەهۆیەوە ژمارەیەكی زۆر گیانیاندا و هەزار و پێنسەد خانوو وێران و نەوەد و چەند بورجی دیوارەكە داڕما. لەگەڵ ئەم ئەردهەژێنەدا دەنگی گرمەیەكی مەترسیدار بیسترا كەكەس ناتوانێت وەسفی بكات. چیای ئەو ناوچە كەبێ گیا بوو، لەت لەت بوو و رژایە ناو دەریا.

لەم رۆژەدا دەریا ئارامی نەبوو و دووكەڵێكی ڕەش وبۆگەنی لێ بەرز دەبوویەوە و رووبارێك كە لەیەك فەرسەخی شارەكە بوو، ون بوو بێ ئەوەی كەس بزانێت چی لێهات. وەك دەڵێن خەڵك بەردەوام هاواری مەترسیداریان دەبیست و ژمارەیەكی زۆر بەهۆی ئەو دەنگەوە گیانیان لەدەستدا.

سەرزەمینی جەزیرە و كەنارەكان و تەرسوس و ئەدەنە و شام هەموو لەرانەوە و ژمارەیەكی كەمی خەڵكی لازقیە گیانیان رزگاری بوو و خەڵكانی جەبەلە مردن.

---

[٢٢] لەمێژووی تەبەری بەماحوزە هاتووە و دەبێت ئەمە راست بێت (وەرگێر)

هەروەها لەم ساڵەدا ئاوی سەرچاوەی مەککە وشکی کرد و بەهای یەك مەشکە ئاو بۆ یەك درهەم بەرز بوویەوە. متوەکیل پارەی نارد و خەرجی ئەم سەرچاوەی کرد.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی باوکی ئیسرائیل و هیلالی رازی مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا نەجاح کوڕی سەلمە مرد. چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو: ئەو سەرپەرەستی دیوان واژۆ (مۆر) و ئۆدەداری چاودێری کردنی کرێکاران و سەرپەرەستی مڵکەکان بوو. هەموو کرێکاران خۆیان لەو بەدوور دەگرت و نیازەکانی ئەویان بەدیدەهێنا. هەندێکات دەبووە هاونشینی شەوانەی متوەکیل. حەسەن کوڕی مەخلەد و موسا کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ عوبەیداللە کوڕی یەحیا کوڕی خاقان، وەزیری متوەکیل، هاورێ بوون. حەسەن سەرپەرەستی دیوانی ئەملاك بوو و موسا سەرپەرەستی دیوانی خەراج. نەجاح کوڕی سەلمە سەبارەت بەم دووانە نامەیەکی بۆ متوەکیل نووسی و ئەوانی بەخیانەتکار وکەمتەرخەم لەقەڵەمدا و ئەوەی کەئەو دەتوانێت چل هەزار درهەم لەشوێنەکەی ئەوان داهاتی دەستکەوێت. متوەکیل پێی وت: بەرەبەیانی بەیانی وەرە بارەگاکەم تا ئەو دووانە بەتۆ بسپێرم. بەیانی ئەو رۆژە نەجاح لەگەڵ ئەو پاسەوانانەی بۆ گرتنی ئەوان لەگەڵ خۆی ئامادەی کردبوون، بەرێکەوت. عوبەیداللە کوڕی یەحیای وەزیر ئەوی بینی و وتی: باشترە لەگەڵ ئەوان رێگەی سازان بگریتەبەر و نامەیەك بۆ متوەکیل بنووسیت کە لەکاتی وتنی ئەو قسانە مەست بوویت و لەرووی نەزانییەوە ئەو وتانەت هێناوەتە سەرزمان و من ئەم بارودۆخە بۆ تۆ هێور دەکەمەوە. ئەو فێڵی لێکرد تا ئەوەی نەجاح نامەکەی نووسی و عوبەیداللە ئەوی گەڕاندەوە و حەسەن و موسای بانگ کرد و ئاگاداری کردنەوە و پێی وتن نامەیەك بۆ متوەکیل بنووسن و تیایدا گرتنی دوو هەزار هەزار دینار لەنەجاح و هاوەڵانی ئەو دەستەبەر بکەن. ئەوان ئەم نامەیان نووسی. عوبەیداللە هەر دوو نامەکەی هەڵگرت و ڕۆشتە لای متوەکیل و وتی: نەجاح لەوتەکەی خۆی پەشیمان بۆتەوە و ئەمە نامەی موسا و حەسەنە کەبەڵێن دەدەن ئەوەی لەنامەکەدا نووسیوانە بیبەنەسەر و تۆ ئەوەی بەڵێنیان داوە، وەریدەگریت. رێز لەم دوانە بگرە تا ئەو پارەیە وەربگریت.

متوەکیل رازی بوو و فەرمانیدا نەجاجح بەو دوانە بسپێرن. حەسەن و موسا، نەجاح و منداڵەکانیان گرت و هەموویان دانیاننا بەوەی سەد و چل هەزار دیناریان هەیە جگە لەدانەوێڵە و دار و ملك و زەوی و زار. متوەکیل دەستی بەسەر هەمویاندا گرت و فەرمانیدا نەجاح ئەشکەنجە بکەن. هێلگکەی گونی ئەویان بەرادەیەك گوشی تا

گیانیدا. منداڵەکانیشی دوای ئەشکەنجە دران دانیان بەسامانەکەی خۆیاننا کەبریتی بوو لەحەفتا هەزار دینار جگە لەزەوی و ملك و ماڵ. متوەکیل دەستی بەسەر هەموو سامانەکاندا گرت و لەکارگوزارەکانی کوڕی نەجاح لەهەموو شارەکان سامانێکی زۆری سەند.

هەروەها لەم ساڵەدا رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر سەمەیسات و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ژمارەیەکی بەرچاویان ئەسیر کرد. عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی لەهاویندا شەڕی کرد وخەڵکانی لۆلۆ رێگەیان نەدا سەرکردەکەیان بڕواتە ناو قەلاکە. پاشای رۆم شاسوارێکی نارد و بەڵێنیدا تا بەهەرکام لەوان یەك هەزار دینار بدات بۆ ئەوەی لۆلۆی پێ بسپێرن. ئەوان شاسوارەکەیان لەدیوارەکە کێشایەسەر و مانگانە و رۆژانەی وەرنەگیراوی خۆیان لەو وەرگرت و دواتر شاسوار و لۆلۆیان بەبلکاجور سپارد و ئەویش شاسواری بۆ لای متوەکیل نارد. پاشای رۆم رازی بوو بۆ ئازاد کردنی ئەو هەزار ئەسیری موسوڵمان بدات.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیمی پێشەوا، ناسراو بەزەینەبی، کارگوزاری مەککە، ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

متوەکیل، نەورۆزی لەرۆژی یانزەی رەبیع الاوەل، حەڤدەی ژوئەن و حەڤدەی حوزەیران و بیست و هەشتی ئوردیبەهێشت کرد ( ئەم رۆژە رۆژی کۆکردنەوەی خەراجی لێپرسراوانی خەراج بوو. بەحتەری لەمبارەوە ئەم هۆنراوەی هۆنیوەتەوە:

ان یوم النیروز عاد الی العهـــ          د الذی کان سنه اردشیر

واتاکەی: جەژنی نەورۆز بۆ ئەو رۆژگارە گەڕایەوە کەئەردەشێر بناغەی بۆ دانا بوو.

## هێرشی ناباوەڕانی ئاندۆلۆس بۆ سەرزەمینە ئیسلامییەکان

لەم ساڵەدا ناباوەڕانی ئاندۆلۆس بەکەشتییە جەنگییەکانی رۆم هێرشیان کردە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان. محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، پاشای ئاندۆلۆس، فەرمانیدا سوپایەك بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە بکەن. کەشتییەکانی رۆم گەیشتنە ئەشبیلییە و ڕۆشتنە ناو دورگەکە و بۆ جەنگ هاتنە ناو شارەکە و مزگەوتی هەینیان سوتاند و بەخێرایی لەوێ گوزەریان کرد و پەنایان بۆ قەڵای ئەریوالە برد.

ناباوەڕان تا دیواری سەرزەمینی فەرەنگ هاتنە پێشە، تالآنییان کرد و ڕفاندیان و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر کرد و گەڕانەوە. لەم کاتەدا کەشتییە جەنگییەکانی محەممەد رووبەروویان بوویەوە و دوای جەنگێکی فراوان دوو کەشتی رۆمییەکانیان سوتاند ودوو کەشتییان گرت و هەموو سامانی ئەم دوو کەشتییەیان تالآن کرد. خوێنی ناباوەڕان لەم کاتەدا هاتە جۆش و جەنگێکی بوێرانەیان دەست پێکرد و ژمارەیەکیان لەموسوڵمانان کوشت. کەشتییە جەنگییەکانیان خۆیان گەیاندە بەنبلونە و غەرسیە، پاشای فەرنگیان گرفتار کرد. پاشا بۆ خوێنبایی خۆی نەوەد هەزار دیناری دا.

لەم ساڵەدا کارگوزاری تەرسونە مەبەستی بەنبلونە (پامپلونا)ی کرد و دەستی بەسەر قەڵای بیلساندا گرت و خەڵکەکەی ئەسیر کرد بەڵام رۆژی دووەم رووبەرووی موسوڵمانان بوویەوە و ژمارەیەکی لێ کوشتن.

## جەنگی بەربەرەکان و کوڕی ئەغلەب لەئەفریقییە

لەجومادی الاخرە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە لەنێوان بەربەرەکان و سوپاکەی باوکی ئیبراهیم ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەغلەب شەڕێکی گەورە روویدا.

هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو کەبەربەرەکانی لەهان لەدانیماڵیاتی دەیەك و خەراجی کارگوزارەکەی خۆیان، خۆیان بەدوور گرت و رێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و شکستیان پێ هێنا. ئەو هەڵات و لە لەبدە نیشتەجێ بوو، دواتر رێگەی تەرابلوسی گرتەبەر. ئەحمەد کوڕی محەممەدی پاشا سوپایەکی بەفەرماندەیی زیاد

اللەی برای بۆ هاوکاری ئەو نارد و بەمشێوەیە بەربەرەکان هەلاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. زیاد دەستەیەك لەسوارەکانی بەشوێن ئەواندا رەوانە کرد و ئەوان هەر کەسێکیان دەگرت، دەستبەجێ دەیانکوشت. دەستەیەکیان ئەسیر کرد و دواتر سەریان برین و ئەوەی لەناو ئوردووگاکەدا بوو، سوتاندیان. دواتر بەربەرەکان ملکەچی و گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا و قەرزەکانی خۆیاندا و ناسازگارییان پشتگوێ خست.

### بیر کردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی ئیسحاقی نەحوی ناسراو بەکوڕی سەکیت مرد. چۆنیەتی مەرگی بەم شێوە بوو: متوەکیل بانگی کرد ولێی پرسی: کام یەك لای تۆ رێزدارترن: موعتەز و مۆئەییەد یا حەسەن و حسەین؟ کوڕی سەکیت بەریسوایی ئاماژەی بەدوو کوڕەکەی متوەکیل دا و حەسەن و حسەینی بەرێزدار ناوبرد. متوەکیل فەرمانی بەتورکاندا بەلەقە لەسکی بدات. ئەوەندەیان لێدا کەئەو کاتەی دەیانبردەوە بۆ ماڵ، مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا زو ئەلنونی میسری لەمانگی زیقەعدە/ ژانویە کۆچی دوایی کرد و باوکی تورابی نەخشەبی سۆفی بەهۆی گەستنی ئاژەڵەکانی بیابان کۆچی دوایی کرد. باوکی عەلی حسەین کوڕی عەلی ناسراو بەکەرابیسی، هاورێی شافیعی، مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بۆ ٨٦٢/٢٤٨ زایینی دەگێڕنەوە.

لەم ساڵەدا سوار کوڕی عەبدوللەی قازی عەنبەری دوای ئەوەی سۆمای چاوی لەدەستدا، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و شەشی کۆچی ( ٨٦٠ زایینی )

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عەبدوللەی ئەقتەع جەنگی هاوینەی ئەنجامدا و حەڤدە هەزار کەسی ئەسیر کرد. ئەو لەگەڵ خەڵکانی قەریباس جەنگی و پێنج هەزار کەسیشی لەوان گرت. فەزڵ کوڕی قارن جەنگی دەریایی ئەنجامدا و دەستی بەسەر قەڵای ئەنتاکییەدا گرت. ئەو هەروەها لەگەڵ بەلکاجو جەنگا و تالانی زۆری کۆکردەوە و کەسانێکی زۆری ئەسیر کرد. عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنیش ڕووی کردە گۆڕەپانی جەنگ و پێنج هەزار دیلی گرت و نزیکەی دە هەزار چوارپێ و ڕانە مەڕ و گوێدرێژی وەك تالانی دەستکەوت.

لەم ساڵەدا متوەکیل ڕۆشتە شاری تازە دروست کراوی جەعفەرییە.

لەم ساڵەدا ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان لەسەر دەستی عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی ئەنجامدرا و دوو هەزار و سێسەد و شەست و حەوت ئەسیر ئاڵ و گۆڕ کران.

لەم ساڵەدا لەبەغداد بۆ ماوەی بیست و چەند ڕۆژ باران باری بەشێوەیەك لەسەر زەوییە ڕەقەکانیش گژ و گیا سەری دەرهێنا. متوەکیل نوێژی جەژنی ڕەمەزانی لەجەعفەرییە خوێند. هەواڵی بۆ هات لەرێگەیەك کەبەرێگەی وەرزێرەکان بەناو بانگ بووە، خوێنی تازە باریوە.[٢٣]

محەممەد کوڕی سلێمانی زەینەبی لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. خەڵکانی سامەرا لەرۆژی دووشەممە مانگیان بینی و جەژنیان کرد و خەڵکانی مەککە لەرۆژی سێ شەممە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، لەگەڵ سوپایەکی گەورە و توێشووی فراوان بەرەو بەنبلونە بەرێکەوت و ئەو ناوچەی وێران و هەموو سامانەکەی تالان کرد و تا ئەو جێگەی توانی خوێنی ڕشت و قەڵای فیروس و حەسەن و قەشتەلی گرت. لەوێ فەرتون کوڕی غەریسەی گرت و بۆ

---

[٢٣] ڕەنگی بارانی سور کەپەڵەی سوور لەسەر زەوی بەجێدێڵێت، بەهۆی گەردیلەکانی تەپ و تۆزەوەیە و کاتێك بۆ توێژەکانی سەرەوەی جەو بەرز دەبێتەوە، دواتر لەناو دڵۆپەکانی باران قەتیس دەبێت و بارانەکە سور بەرچاو دەکەوێت و نابێت بەئەفسانە بزانرێت. (وەرگێڕ)

ماوەی بیست و چەند ساڵ لەکوردوبا زیندانی کرد. دواتر ئازادی کرد و ڕەوانەی سەرزەمینەکەی کردەوە. ئەو بۆ ماوەی نەوەد و شەش ساڵ ژیا. محەممەد سی و دوو ڕۆژ لەبەنبلونە مایەوە.

لەم ساڵەدا دەعبەل کوڕی عەلی خوزاعی کەخۆی بەشیعی دەزانی و لەساڵی ٧٥٦/١٤٨ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا بوو، مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا سەری کوڕی موعازی شەیبانی فەرمانداری ڕەی مرد. ئەو کەسێکی چاکەکار و فرەزان بوو و لەهەمان شار چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەحمەد کوڕی ئیبراهیمی دەورەقی لەبەغداد و محەممەد کوڕی سلێمانی ئەسەد بەنازناوی کەوین لەم ساڵەدا مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و حەوتی کۆچی ( ٨٦١ زایینی )

### کوژرانی متوەکیل

لەم ساڵەدا متوەکیل کوژرا. هۆکاری مەرگی ئەو ئەمە بوو: متوەکیل فەرمانیدا بۆ گرتنی زەوییەکای وەسیف لەئیسفەهان و کێوەکان و سپاردنی ئەوان بەفەتح کوڕی خاقان دەفتەرەکان بکەنەوە. لەمبارەوە چەندین نامە نووسرا و پۆشتە دیوانی خاتەم. وەسیف ئاگادار بوویەوە. لەم کاتەدا متوەکیل دەیویست نوێژی یەکەم هەینی ڕەمەزان/ نۆڤەمبەر لەگەڵ خەڵکان بخوێنێت و خەڵکان ئاگادار بوون و لەبەر ئەم کۆببوونەوە. مناڵەکانی هاشمیش هاتنەدەر تا ئەو کاتەی دەیبینن، سکالانامەکانی خۆیانی تەسلیم بکەن.

بۆ ڕۆژی هەینی، کاتێك خەلیفە مەبەستی نوێژی کرد، عوبەیدالله کوڕی یەحیا و فەتح کوڕی خاقان پێیان وت: خەڵکان لەبنەماڵەی تۆ و کەسانیتر بەژمارەیەکی زۆر کۆبوونەتەوە، دەستەیەك دەخوازن سکالا نامەکانی خۆیان تەسلیم بەتۆ بکەن و دەستەیەکیش نیازمەندن، سەرەوەری باوەڕدارانیش گرفتاری نەخۆشی سنگە، ئەگەر سەروەری باوەڕداران بەباشی دەزانێت یەکێك لەجێگرەکانی خۆی ڕاسپێرێت تا نوێژ لەگەڵ خەڵکان بخوێنێت و ئێمە هەمووان لەگەڵی دەبین.

متوەکیل فەرمانی بەمونتەسیردا نوێژ لەگەڵ خەڵکان بخوێنێت. کاتێك مونتەسیر بۆ نوێژ هەستا، ئەو دوانە وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران ئەگەر بەباشی دەزانی موعتەز بۆ نوێژ ڕەوانە بکە تا بەم کارە ڕێزی لێ بگریت و خواوەند ئەم پێگەی بەو بەخشیوە. موعتەز لەو کاتەدا مناڵێکی بۆ هاتبووە دنیا. متوەکیل فەرمانی بەموعتەزدا نوێژ لەگەڵ خەڵکان بخوێنێت. ئەو بۆ نوێژ ڕۆشت و مونتەسیر بۆ ماڵەکەی لەجەعفەرییە گەڕایەوە و ئەمە بۆ کوشتنی متوەکیل هانیدا. کاتێك موعتەز کۆتایی بەوتارەکەی هێنا، عوبەیدالله و فەتح کوڕی خاقان هەستان و دەست و قاچی ئەویان ماچ کرد. موعتەز دوای نوێژ خوێندن گەڕایەوە و ژمارەیەکی زۆری خەڵك هاوڕێیەتی چوارپێکەی ئەویان دەکرد تا گەیشتەوە لای باوکی. ئەویان لای باوکی وەسف کرد و متوەکیل لەم کارە شادمان بوو.

بۆ جەژنی ڕەمەزان، متوەکیل وتی: بەمونتەسیر بڵێن نوێژ لەگەڵ خەڵکان بخوێنێت. عوبەیداللە پێی وت: خەڵکان پێشتر لەڕۆژی هەینی چاوەڕوانی سەروەری باوەڕداران بوون و بۆ ئەو مەبەستە کۆببوونەوە بەڵام سەروەری باوەڕداران پێشنوێژی بۆ نەکردن و هەنووکە دەترسین ئەگەر ئەمڕۆ نوێژیان لەگەڵ نەخوێنێت، خەڵکان بوختانی بۆ هەڵبەستن. ئەگەر سەروەری باوەڕداران دەخوازیت چاوی دۆستان ڕووناك و دوژمنان سەرکوت بکات، ئەمڕۆ نوێژ لەگەڵ خەڵکان بخوێنێت.

متوەکیل بۆ نوێژ ڕۆشت و خەڵکان لەمەودای چوار میل بۆ نوێژ ریزیان بەست. هەموو سوارەکان لەئەسپەکانی خۆیان دابەزین. متوەکیل نوێژی خوێند و گەڕایەوە. لەم کاتەدا مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەر خۆیدا، وتی: فراوانی ژمارەی نوێژ خوێنەکانم بینی کە لەژێر فەرمانی مندا بوون و دەمویست بەمشێوەیە ریسوایی خۆم لەبەرابەر خوا نیشان بدەم (بەڵام ئەو کارەم نەکرد) بۆ ڕۆژی سێیەم تامەزرۆی بەگۆشتی مەڕەوە کرد و کەمێك گۆشتی مەڕی خوارد. لەم کاتەدا کوڕی حەفسی و دەستەیەکی دیکەی لا بوون. ئەوانیش لەگەڵ متوەکیل گۆشتیان خوارد. متوەکیل وتی: هیچ ڕۆژێك بەئەندازەی ئەو ڕۆژە شاد نەبووە. ئەو هاونشین و گۆرانیبێژەکانی بانگ کرد. ئەوان هاتنە بارەگاکەی و دایکی موعتەز عابایەکی حەریری سەوزی پێشکەش کرد کەهاوتای نەبینرابوو. متوەکیل بەوردی لێی ڕوانی و سەرسوڕمانی خۆی نیشاندا. فەرمانیدا بیکەن بەدوو کەرت و بۆ دایکی موعتەزی بگێڕنەوە و بەپەیەك پەیامی بۆ نارد: سوێندم خوارد کەهەرگیز نەیپۆشم و حەز ناکەم کەس دوای من لەبەری بکات لەبەر ئەوە فەرمانمدا بیکەن بەدوو کەرت.

کەسانی دەوروبەر وتیان: سوێندت دەدەین بەخوا بەمشێوەیە مەدوێ. متوەکیل شەرابی زۆری خوارد و بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا، ماوەیەکی کەمی دوای ئێستا، لای ئێوە دەڕۆم. تا شەو بەخۆشی ژیانی بردە سەر و خۆشحاڵ بوو. لەم کاتەدا ئەو و فەتح کوڕی خاقان بڕیاریاندا ڕۆژی دواتر مونتەسیر (منداڵ و جێگرەکەی خۆی) و وەسیف و بوغا بکوژن. مونتەسیریش لەگەڵ تورکەکان و وەسیف و کەسانی دیکە بڕیاریاندا بوو متوەکیل بکوژن.

ڕۆژێك پێش ئەم ڕووداوە، متوەكیل گاڵتەی بەمونتەسیری كوڕی دەكرد. جارێك جوێنی پێ دەدا و جارێكی دیكە زیاتر لەئەندازەی خۆی شەرابی دەرخوارد دەدا و جارێك فەرمانی دەدا شەقەزللەی لێ بدەن و جارێكی دیكە هەڕەشەی كوشتنی لێدەكرد. ئەوسا بەفەتحی وت: لەخزمایەتی پێغەمبەر (د.خ) بەدوور بم ئەگەر شەقەزللە لەروخساری مونتەسیر نەدەیت. فەتح هەستا و دوو شەقەزللەی لێدا و دەستی بەپشتیدا هێنا. دواتر متوەكیل بەكەسانی دەوروبەری وت: هەمووتان شایەت بن كەمن موستەعجیل(مونتەسیرم) لەجێگری خۆم دوور خستۆتەوە، دواتر ڕووی كردە مونتەسیر و وتی: ناوی تۆم نا مونتەسیر و خەڵكان بەهۆی نەزانیی تۆوە ناویان نای مونتەزیر و هەنووكە بەموستەعیجل ناو دەبرێیت.

مونتەسیر وتی: ئەگەر فەرمانی كوشتنی منت دەدا، لەوەی كردت، بۆ من ئاسانتر و خۆشتر بوو.

متوەكیل وتی: شەرابی دەرخوارد بدەن. دواتر فەرمانیدا سفرەی ئێواری ڕاخەن. سفرە ڕاخرا. كات، ناوەڕاستی شەو بوو. مونتەسیر لەبارەگای متوەكیل هاتەدەر و بەبونان، كۆیلەی ئەحمەد كوڕی یەحیای وت پەیوەستی ببێت. مونتەسیر هەروەها دەستی زەرافەی پەردەداری گرت و داوای لێكرد لەگەڵ ئەو بەرێكەوێت. زەرافە وتی: سەروەری باوەڕداران هێشتا بەئاگایە (ناتوانێت لەگەڵ مونتەسیر بڕوات) مونتەسیر وتی: ئەو ئێستا سەرخۆشە و بوغا كەسانی دیكە دوای ماوەیەكی كەم دەڕۆن. حەز دەكەم كاری مناڵەكەت بەمن بسپێریت چوونكە ئوتامە داوای لێكردووم كچەكەی تۆ بكەمە هاوسەری كوڕەكەی و كچەكەی ئەو بكەمە هاوسەری تۆ. زەرافە وتی: هەمووان بەندەی تۆین، هەرچی دەخوازی، فەرمان بدە. مونتەسیر لەگەڵ زورافە ڕۆشتنە ناو ژوورێك و پێكەوە نانیان خوارد كە لەناكاو دەنگی ناڵەیان بیست. هەردووك هەستان و لەم كاتەدا مونتەسیر بوغای بینی و وتی: ئەم هاوارە چی بوو؟. بوغا وەڵامی دایەوە: چاكە و خۆشی، ئەی سەروەری باوەڕداران. مونتەسیر وتی: هاوار لەتۆ، ئەوە دەڵێی چی؟ بوغا وتی: خواوەند سەبارەت بەسەروەرمان، سەروەری باوەڕداران پاداشێكی گەورەی بەتۆ بەخشی. ئەو بەندەی خوا بوو و بانگەوازی خواوەندی وەڵام دایەوە.

مونتەسیر دانیشت و فەرمانیدا دەرگای ئەو ژوورەی متوەکیلی تیا کوژرا، ببەستن و هەموو دەرگاکانیان داخست. مونتەسیر کەسی بۆ لای وەسیف نارد و فەرمانیدا موعتەز و مۆئەییەد بێنێت تا وەسیەت نامەی متوەکیلیان لێ بستێنێت.

چۆنیەتی مەرگی متوەکیل بەم شێوە بوو: کاتێك مونتەسیر هاتەدەر، متوەکیل فەرمانیدا سفرە راخەن. بوغای بچوك، ناسراو بەشەرابی، لای پەردەکە وەستا بوو. ئەو رۆژە ئەرکی پاسەوانی کردن لەئەستۆی بوغای گەورە بوو بەڵام کوڕەکەی، موسا لەجیاتی باوکی پاسەوانی کۆشکی دەکرد. موسا کوڕە خاڵی متوەکیل بوو و باوکی لەو کاتەدا لەسومەیسات ژیانی بەسەر دەبرد. بوغای بچوك هاتە شوێنی دانیشتنەکە و فەرمانی بەهاونشینەکاندا برۆنە ژوورەکانی خۆیان. فەتح کوڕی خاقان پێی وت: هێشتا کاتی ڕۆشتن نییە و سەروەری باوەڕداران هێشتا هەڵنەستاوە. بوغا وتی: سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم هەرکات زیاتر لەحەوت پێکی خواردەوە، ئێوە بکەمەدەر و هەنووکە چواردە پێکی خواردووە. بنەماڵەی سەروەری باوەڕداران هەنووکە لەپشت پەردەوە وەستاون. بوغا هەموویانی دەرکرد و تەنیا فەتح و عەسعەس و چوار کەس لەخزمەتکارە تایبەتەکان و باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل لەدایکەوە برای مۆئەییەد بوو، مانەوە.

بوغای شەرابی جگە لەدەرگای رووبار کەبکوژەکانی متوەکیل لەوێوە هاتنە ناو، هەموو دەرگاکانی بەست. کاتێك ئەم دەستەیە لەدەرگاکەوە هاتن، باوکی ئەحمەد ئەوانی بینی و هاواری کرد: ئەی ریسواکان، ئێوە کێن؟ ئەوان شمشێریان دەرکێشابوو. کاتێك متوەکیل دەنگی باوکی ئەحمەدی بیست، سەری خۆی بەرز کردەوە و ئەوانی بینی، وتی: بوغا، ئەوانە کێن؟ بوغا وتی: پاسەوانەکانی ئەمشەون. کاتێك متوەکیل قسەی دەکرد، ئەوان کەمێك دەکشانەوە. لەم کاتەدا هێشتا واجن و هاوەڵانی و مناڵەکانی وەسیف پەیوەستیان نەبوون. بوغا بەوانی (متوەکیل و کەسەکانی) وت: ئەی ریسواکان، بەناچاری دەبێت تامی مەرگ بچێژن، کەواتە رێزدارانە پێشوازی لەمەرگ بکەن. لەم کاتەدا شمشێر بەدەستەکان گەڕانەوە و پێش هەمووان بەغلون بەشمشێر لەشان و گوێی متوەکیلیدا و هەڵیدڕی.

متوەکیل وتی: کەمێك چاوەڕێ بە، خواوەند دەستت بقرتێنێت و مەبەستی ئەوەی کرد هێرش بکاتە سەر بەغلون و بەدەست یەخەی ئەوی گرت بەڵام بەغلون بەیەك شمشێر دەستی بڕی. باغر لەم کاتەدا بۆ هاوکاری بەغلون هات. فەتح وتی: هاوار لەئێوە، سەروەری باوەڕدارانیش..... خۆی خستە سەر متوەکیل بەڵام ئەوان بەشمشێر جەستەی فەتحیان شەقار شەقار کرد و ئەو هاواری کرد: مردم و خۆی کێشایە دواوە بەڵام لەکۆتاییدا کوشتیان. ئەوان بەوەسیفیان وتبوو پەیوەستیان ببێت و ئەو ترسی خۆی نیشاندابوو و لەوەڵامدا پێیان وتبوو: گومانی خراپ مەکە، چەند لەمناڵەکانی خۆت لەگەڵ ئێمەدا بنێرە و ئەو پێنج کەس لەمناڵەکانی خۆی لەگەڵ ئەوان نارد: سالح، ئەحمەد، عەبدوللە، نەسر و عوبەیدالله.

دەگێرنەوە کاتێك بکوژەکانی متوەکیل ڕۆشتنە ژوور، عەسعەس سەیری کردن وبەمتوەکیلی وت: لەشێر و مار و دووپشك رزگارمان بوو بەڵام هەنووکە گرفتاری ئەم شمشێرانەین. کاتێك عەسعەس باسی شمشێری کرد، متوەکیل وتی: هاوار لەتۆ، کام شمشێرە! هێشتا کۆتایی بەوتەکەی نەهێنابوو کەدەستەیەك هێرشیان کردەسەر و گیانیان گرت و دەستەبەجێ فەتحیشیان کوشت و هەمووان بۆ لای مونتەسیر ڕۆشتن و خەلافەتیان بەو سپارد و وتیان: سەروەری باوەڕداران مردووە، شمشێر بەدەست لای زەرافە وەستان و داوای بەیعەتیان لێکرد و ئەویش بەیعەتی بەست.

مونتەسیر (بۆ فریودان) پەیکی بۆ لای وەسیف نارد کەفەتح کوڕی خاقان باوکی کوشتم و منیش بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئەو فەتحم کوشت. هەر ئێستا لەگەڵ سەرکردەکانی خۆت وەرە. وەسیف و سەرکردەکانی هەمان سات هاتنە بارەگای خەلافەت و بەیعەتیان لەگەڵ مونتەسیر کرد. عەبدوللە کوڕی یەحیا بێ ئاگا لەوەی روویدا بوو، کارەکانی خۆی ئەنجام دەدا، جەعفەر کوڕی حامید هاورێیەتی دەکرد کە لەناکاو کۆیلەیەك هات و وتی: بۆ دانیشتووی، کۆشکی خەلیفە بەشمشێر دەوری گیراوە. عوبەیدالله داوای لەجەعفەر کرد سەیری دەرەوە بکات. جەعفەر هاتەدەر و دوای کەمێك گەڕایەوە و هەواڵی کوژرانی متوەکیل و فەتحی بەعوبەیدالله دا. عوبەیدالله لەگەڵ کەسە نزیکەکان و هاورێیانی خۆی هاتەدەر و

سوار بەلەمێك بوو و خۆی گەیاندە كۆشكی موعتەز، پرسیاری ئەوی كرد بەڵام نەیدۆزییەوە. بەخۆی وت: ئێمە لەخوایین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. ئەو خۆی و منی بەكوشتندا.

بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە هاوەڵان و شوێنكەوتەكانی عوبەیدالله لە (ئەبنا)[٢٤] و عەجەم و ئەرمەن و زەواقیل و كەسانی دیكە كۆبوونەوە. ژمارەی ئەوان نزیكەی دەهەزار كەس و دەستەیەك بەسیانزە هەزار كەس و دەستەیەك بەپێنج تا دە هەزار كەسیان دەزانن. ئەوان وتیان: تۆ ئێمەت بۆ ڕۆژێكی لەم شێوە پەروەردە كردووە، كەواتە فەرمان بدە و مۆڵەتمان پێبدە تا هێرش بكەینە سەر ئەم دەستە و مونتەسیر و هاوەڵانی ئەو بكوژین. عوبەیدالله ئەم فەرمانەی نەدا و وتی: هێشتا موعتەز لەدەستی ئەواندایە.

عەلی كوڕی یەحیای ئەستێرەناس دەڵێت: چەند ڕۆژ پێش كوژرانی متوەكیل یەكێك لەكتێبەكانی شانس و بەختم بۆ دەخوێندەوە. گەیشتمە شوێنێك لەكتێبەكە كەنووسرابوو خەلیفەی دەیەم لەنشینگەكەی خۆی دەكوژرێت و چیتر درێژەم بەخوێندنەوە نەدا. متوەكیل وتی: چییە؟ وتم: باشی و چاكی. وتی: دەبێت هەمووی بخوێنیتەوە، منیش بەم شێوە خوێندمەوە: خەلیفەیەك دەكوژرێت. متوەكیل وتی: خۆزگە دەمزانی ئەو داماوە كێیە.

باوكی وارس، قازی نەسیبین دەڵێت: لەخەودا كەسێكم بینی كەدێت و بەمشێوەیە دەخوێنێت:

یا نائم العین فی جثمان یقظان — ما بال عینك لا تبكی بتهتان

اما رأیت صروف الدهر ما فعلت — بالهاشمی و بالفتح بن خاقان

واتاكەی: ئەی ئەو كەسەی چاوت خەوتووە و جەستەت بەئاگایە بۆ چاوی تۆ هاوشێوەی باران ناگریت. مەگەر پێشهاتەكانی ڕۆژگارت نەبینیوە كە لەگەڵ ئەو هاشمییە (متوەكیل) و فەتح كوڕی خاقان چی كرد.

---

[٢٤] ئەبنا نازناوی منداڵە ئێرانییەكانی یەمەن كەپێشینانی ئەوان لەئێرانییەكان بوون كە بەپێی گێڕانەوەكان كەسرا ئەنەوشیروان ئەوانی بۆ هاوكاری سەیف زی یەزین بۆ وەرگرتنەوەی یەمەن و ڕزگار كردنی لەدەستی حەبەشییەكان ڕەوانەی كردبوو. (وەرگێڕ)

پەیك، چەند ڕۆژ دواتر هەواڵی کوژرانی ئەو دوانەی هێنا.

کوژرانی متوەکیل شەوی چوارشەممە، چواری شەوال/ دوانزەی دێسامبەر و بەگومانێك شەوی پێنجشەممە ڕوویدا. ئەو چواردە ساڵ و دە مانگ و سێ ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەو لەشەوالی ٨٢١/٢٠٦ زایینی لەفەم ئەلسوڵح چاوی بەدنیا هەڵهێنا و نزیکەی چل ساڵ ژیا.

متوەکیل ئەسمەر، چاوانی شەهلا و کەمێك ریش بەروخسارییەوە بوو. شاعیرەکان بۆ مەرگی ئەو هۆنراوەی زۆریان هۆنییەوە کەیەکیان هۆنراوەکەی عەلی کوڕی جوهمە:

عبيد امير المؤمنين قتلنه　　　　و اعظم آفات الملوك عبيدها

بنى هاشم صبرا، فكل مصيبة　　　　سيبلى على وجه الزمان جديدها

واتاکەی: بەندەکانی سەوەری باوەڕداران ئەویان کوشت، گەورەترین بەڵای پاشاکان، بەندەکانی ئەوانن. ئەی منداڵەکانی هاشم خۆڕاگر بن چوونکە هەر تازەیەك بەتێپەڕینی کات، کۆن دەبێت.

## بەشێك لەکار و کردەوەکانی متوەکیل

دەگێڕنەوە باوکی شەمت مەروان کوڕی باوکی جەنوب وتوویەتی: هۆنراوەیەکم بۆ متوەکیل هۆنییەوە کەتیایدا ئاماژەم بەرافزەدا (جوێنم پێدابوو) ئەو منی کردە فەرماندای بەحرەین و یەمامە و چوار دیاری پێبەخشیم.

مونتەسیریش پاداشێکی بەمندا.، متوەکیل فەرمانیدا سێ هەزار دینار بەسەر مندا بیرژێنن و فەرمانی بەمونتەسیر و سەعدی ئیتاخیدا، دینارەکان لەزەوی کۆبکەنەوە و بەمنی بدەن. ئەوان ئەو کارەیان کرد. ئەمە هەمان هۆنراوەیە:

ملك الخليفة جعفر　　　　للدين و النيا سلامه

لكم تراث محمد　　　　و بعد لكم تنفى الظلامه

يرجو التراث بنو البنا　　　　ت و ما لهم فيها قلامه

والصهر ليس بوارث　　　　و البنت لا ترث الامامه

ما للذين تنحلوا　　　　ميراثكم الا الندامه

اخذ الوراثة اهلها　　فعلام لومكم علامه

لو كان حقكم لما　　قامت على الناس القيامه

ليس التراث لغيركم　　لا و الاله و لا كرامه

اصبحت بين محبكم　　و المبغضين لكم علامه

واتاکەی: فەرمانڕەوایی جەعفەری خەلیفە هۆکاری راستی دین و دنیایە. میراتی محەممەد بۆ ئێوەیە و بەدادپەروەری ئێوە، نادادپەروەری لەناو دەچێت. کچەزاکان چاوەڕوانی میراتن، لەکاتێکدا بەئەندازەی سەری نینۆك بەشیان نییە. زاوا، میراتی ناکەوێت و کچ، ئیمامەت بەمیرات نابات. ئەوانەی بانگەوازی میراتی ئێوە دەکەن جگە لەپەشیمان بوونەوە هیچی دیکەیان پێ نابڕێت. میرات کەوتە دەستی خاوەنەکانی، کەواتە سەرکۆنە کردنی ئێوە بۆ چییە؟ لەبەر چییە؟ ئەگەر ئەم مافە بۆ ئێوە (منداڵەکانی فاتیمە) دەبوو، بۆ خەڵکان ڕۆژێکی هەستانەوەی لەم شێوەیە ساز نەدەدرا. ئەم میراتە بۆ کەس جگە لەئێوە (منداڵەکانی عەباس) نابێت، نا سوێند بەخوا بێ چەند و چون بەم شێوەیە. تۆ لەناو هاورێیان و نەیاران، نیشانەیت؟

دواتر متوەکیل بۆ هۆنراوەیەکی هاوشێوەی ئەوەی پێشوو، دە هەزار درهەمی پێدام.

یەحیا کوڕی ئەکسەم دەڵێت: ڕۆشتمە بارەگای متوەکیل. باسی مەئمونمان کرد. من باسی لەپێشی ئەوم کرد، وەسفم کرد و لەزانست و زانیاری ئەو قسەم هێنایە ئاراوە، بەڵام وتەکانی من لای ئامادەبوان جێگەی پەسەند نەبوو. متوەکیل وتی: مەئمون سەبارەت بەقورئان چۆن بیری دەکردەوە؟ وتم: ئەو دەیوت: بەبوونی قورئان چیتر پێویستمان بەزانستێکی تایبەت نییە و بەبوونی سوونەت، لەکردەوەی کەس ترسمان نییە و بەبوونی دەربڕین و تێگەیاندن بەبەڵگەوە، بزوێنەرێك بۆ فێرکاری نییە و دوای خۆ بەدوور گرتن لەگەڵ بوونی بەڵگە و بورهان، پێویستە شمشێر بەکار ببرێت چوونکە بەڵگەکان روون و ئاشکران.

متوەکیل وتی: ئەوەی باست کرد، وەڵامی پرسیارەکەی من نەبوو. یەحیا لەوەڵامدا وتی: ئاماژەدان بەچاکییەکان لەنەبوونی کەسی چاکەکار بۆ ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ کراوە، پێویستە.

متوەكیل وتی: موعتەسەم لەكاتی قسەكانی خۆی چی دەوت؟ سەروەری باوەڕداران موعتەسەم بەردەوام ئەوەی دەوت بەڵام من لەبیرم كردووە. یەحیا وتی: بەردەوام دەیوت: ئەی خوایە! بۆ چاكەكان سپاسی تۆ دەكەم چوونكە كەس جگە لەتۆ ناتوانێت بیانژمێرێت و بۆ گوناحەكانم داوای بەخشین دەكەم چوونكە جگە لەبەخشینی تۆ، هیچ شتێك چارەسەری ناكات.

متوەكیل وتی: لەبیرم كرد مەئموون هەركات حەزی لەشتێك دەكرد، یا ئەو كاتەی مژدەیەكی پێ دەدرا، چی دەوت؟ یەحیا وتی: بیرهێنانەوەی چاكییەكان و فراوانی و ژماردن و قسە كردن سەبارەت بەوان بەو كەسەی چاكەی لەگەڵ كراوە،ە پێویستە و ئەمە هەمان ملكەچ بوون لەبەرابەر فەرمانی خواوەندە، سەبارەت بەچاكی و سپاسی خواوەندە بۆ چاكییەكانی. كەواتە سپاسی خواوەند كەنیعمەت و بەخششەكانی فراوانە و پێگەی بەرزە بەو شێوە شیاوە و شیاوی سپاسە و هەركەس سپاسی بكات، دەبێتە هۆكارێك بۆ فراوان بوونی بەخششەكان. متوەكیل وتی: راست دەكەیت، ئەمە هەمان وتەی مەئمونە.

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی عەبدوللە كوڕی تاهیر لەمانگی سەفەر/ ئاوریل لەمەككەوە هات و دڵگرانی خۆی لەناسازگاری لەدیاری كردنی رۆژی جەژنی قوربان هێنایە سەرزمان. متوەكیل فەرمانیدا نەخشەیەك لەبارەگای ئەو بۆ حاجییەكان ببەن تا بەهۆیەوە مانگی تازەی زیحەججە دەركەوێت. هەروەها فەرمانیدا لەجیاتی نەوت و رۆن لەسەر مەشعەری حەرام و مەشعەرەكانی دیكە، مۆم زیاد بكەن.

لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاوەل/ ژوئەن دایكی متوەكیل مرد و مونتەسیر نوێژی لەسەر خوێند و لەمزگەوتی هەینی بەخاك سپێردرا. مەرگی ئەو شەش مانگ پێش كوژرانی متوەكیل بوو.

## بەیعەتی مونتەسیر

پێشتر باسی كوژرانی متوەكیلمان كرد. لەهەمان شەو باوكی جەعفەر محەممەد كوڕی جەعفەر متوەكیل دەستی مونتەسیری وەك جێگری خۆی گوشی.

لەبەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە، سەرکردەکان، دەبیرەکان، سالارەکان، شاکرییەکان و سوپاییەکان و کەسانی دیکە لەجەعفەرییە کۆبوونەوە. ئەحمەد کوڕی خەسیب نامەیەکی خوێندەوە کەتیایدا بەپێی وتەی مونتەسیر نووسرابوو کەفەتح کوڕی خاقان متوەکیلی کوشتووە و مونتەسیر تۆڵەی باوکی سەندۆتەوە و خوێنی ڕشتووە. خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ مونتەسیر کرد و عوبەیدالله کوڕی یەحیا کوڕی خاقان بەیعەتی کرد و گەڕایەوە.

دەگێڕنەوە: باوکی عوسمان سەعیدی بچوك وتوویەتی: ئەو شەوەی متوەکیل کوژرا، ئێمە لەگەڵ مونتەسیر لەماڵەکەی ئەودا بووین.، هەرکات فەتح دەڕۆشتەدەر، مونتەسیر لەگەڵی دەڕۆشت و هەرکات دەگەڕایەوە، لەگەڵ وەستانی ئەو دەوەستا و هەرکات مەبەستی سواربوون لەسەر ئەسپی دەکرد، مونتەسیر دەستی بۆ دەگرت و لەسەر زینی ئەسپەکەی جل و بەرگەکانی بۆ چاك دەکرد.

ئاگادار بووینەوە کەعوبەیدالله کوڕی یەحیا دەستەیەکی لەسەر ڕێگەی مونتەسیر داناوە تا لەکاتی گەڕانەوە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بیکوژن. متوەکیل پێش هاتنی مونتەسیر جوێنی پێدابوو و ڕەنجاندبووی. مونتەسیر تورە لەبارەگای باوکی هاتەدەر و ئێمەیش هاوڕێ لەگەڵ ئەو بۆ ماڵەکەی گەڕاینەوە. مونتەسیر کاتێکی لەگەڵ تورکەکان دیاری کرد تا لەکاتی مەستیدا متوەکیل بکوژن.

باوکی عوسمان دەڵێت: کەمێك دواتر، نێردەی مونتەسیر هاتە لام تا بڕۆمە لای چوونکە متوەکیل چەندین کەسی بۆ لای مونتەسیر ڕەوانە کردبوو بۆ ئەوەی بڕواتە کۆشکەکەی. باوکی عوسمان دەڵێت: بەخۆم وت بەناچاری لەڕێگەدا مونتەسیر دەکوژن، سوار ئەسپەکەم بووم و خۆم گەیاندە بەر دەرگای ماڵەکەی. دەرگاوانەکانی مونتەسیر لەبەر خۆیانەوە قسەیان دەکرد و لەناکاو واجن هات و وتی متوەکیل کوژراوە. مونتەسیر سوار بوو، منیش بەدوای ئەو ئەسپم غاردا و لەیەکێك لەڕێگەکان خۆم پێگەیاند. کاتێك مونتەسیر بەو شێوەیە منی بینی، وتی: مەترسە، قومێك شەراب پەڕیوەتە قوڕگی سەروەری باوەڕداران و خنکاوە. خواوەند بیبەخشێت.

ئەم قسەم پێ ناخۆش بوو. ئێمە هاوڕێ لەگەڵ ئەحمەد کوڕی خەسیب و

دەستەیەك لەسەركردەكان لەرێگەدا بووین تا گەشتینە بەردەم بارەگای متوەكیل. مونتەسیر لای هەر دەرگایەك كەسێكی دانا. وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران شیاو نییە لەم كاتەدا كەسەكانت لەتۆ جیا ببنەوە. وتی: راست دەكەیت، تۆ لەپشتەوە ئاگات لەمن بێت. ئێمە ئەومان خستە نێوان خۆمان و هەموو ئەوانەی هاتبوون، بەیعەتیان كرد و هەركەس دەهات، دەوەستێندرا تا ئەوەی سەعیدی گەورە هات. مونتەسیر ئەوی بەدوای مۆئەییەد نارد و بەمنی وت: تۆیش برۆ و موعتەز بێنە. من ترساو و نیگەران لەگەڵ دوو كۆیلە بەرێكەوتم. كاتێك گەیشتمە بەردەم ماڵەكەی، هیچ پاسەوان و دەرگاوانێكم نەبینی. خۆم گەیاندە دەرگا گەورەی كۆشكەكەی و تەقەم لێدا. دوای كەمێك، كەسێك پرسی: كێیت؟ وتم: نێردراوی مونتەسیر، سەروەری باوەڕداران. ئەو ڕۆشت و درنگی كرد. ترس دایگرتم و زەوی تەسك و تەنگ دەهاتە بەرچاوم. لەم كاتەدا دەرگا كرایەوە و بەیدونی خزمەتكار هاتەدەر و دەرگای لەپشت سەری خۆی بەست و هەواڵەكانی لەمن پرسی. پێم وت قومێك شەراب لەقوڕگی سەروەری باوەڕداران گیری كرد و دەست بەجێ گیانی سپارد. خەڵكان كۆبوونەتەوە و بەیعەتیان لەگەڵ مونتەسیر كردووە و هەنووكە ئەو منی ناردووە تا موعتەز بۆ وەرگرتنی بەیعەت ببەم.

ئەو گەڕایەوە بۆ ناو كۆشكەكە و دوای ماوەیەك هات و منی بردە لای موعتەز. موعتەز وتی: هاوار لەتۆ، چی بووە؟ لەمەرگی متوەكیل ئاگادارم كردەوە و دڵنەواییم كرد، گریام و وتم: وەرە تا یەكەم كەس بیت بەیعەت لەگەڵ مونتەسیر دەكەیت و بەمشێوەیە دڵی براكەت لەخۆت رازی بكەیت. وتی: با بزانم تا بەیانی چی دەبێت. من و بەیدون بۆ هاتنی ئەو پێداگریمان دەكرد تا ئەوەی سوار ئەسپەكەی بوو و بەرێكەوتین. لەرێگە بەردەوام قسەم بۆ دەكرد. ئەو پرسیاری عوبەیداللە كوڕی یەحیای كرد و لەوەڵامدا وتم: بەیعەت لەخەڵك وەردەگرێت و فەتحیش بەیعەتی كردووە. بەم وتەیە هیوابڕاو و تەسلیم بوو. لەم كاتەدا گەشتینە بەردەرگا، دەرگایان بۆ كردینەوە و ڕۆشتینە لای مونتەسیر. مونتەسیر كاتێك موعتەزی بینی، لەئامێزی گرت، دڵنەوایی كرد و بەیعەتی لێ سەند.

سەعیدی گەورە مۆئەییەدی هێنا. مونتەسیر هاوشێوەی موعتەز هەڵس و كەوتی

لەگەڵ کرد. خەڵکان شەویان کردە رۆژە. لەم کاتەدا مونتەسیر فەرمانیدا متوەکیل و فەتح بەخاك بسپێرن.

بۆ بەرەبەیان، لەماخورە ( ئەو شارەی متوەکیل دروستی کردبوو) و سامەرا هەواڵی ئەم کوژرانە لەناو خەڵکان بلاْوبوویەوە و دەستەیەك لەسوپاییەکانی شاکرییە و ئاژاوەچییەکانی دیکە لەباب ئەلعامە و جەعفەرییە کۆبوونەوە. ژمارەی خەڵکان زیادی کرد و یەکتریان لەم هەواڵە ئاگادار کردەوە و سەبارەت بەبەیعەت قسەیان دەکرد. لەم کاتەدا عیتاب کوڕی عیتاب یا بەگومانێك زەڕافە ڕۆشتە لایان و لەزمانی مونتەسیرەوە موژدەی پێدان. ئەوان جوێنیان بەمونتەسیر دەدا. ئەو گەڕایەوە و مونتەسیری لەچەند و چۆنی بارودۆخ ئاگادار کردەوە. مونتەسیر لەگەڵ دەستەیەك لەمەغربییەکان لەکۆشك هاتەدەر و فەرمانی گرتنی ئەوانی دەرکرد. ئەوان تا دەروازەکانی کۆشك بلاْوەیان بەخەڵکان کرد و بلاْوەیان لێکرد. لەم قەرەباڵغییە شەش کەس کوژران.

## فەرمانڕەوایی خەفاجە کوڕی سوفیان و کوڕەکەی محەممەد لەسیسیل و شەڕەکانی ئەم دوانە

لەرووداوەکانی ساڵی ٨٥٠/٢٣٦ زایینی باسمان کرد کەعەباس، فەرمانڕەوای سیسیل، لەساڵی ٨٦١/٢٤٧ زایینی مرد. کاتێك عەباس مرد، خەڵکان عەبدوللە کوڕی عەباسیان کردە فەرمانڕەوا و ئەم کارەیان بۆ فەرمانڕەوای ئەفریقییە نووسی. عەبدوللە جەنگی دەستپێکرد و لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان بەرێکەوت و دەستی بەسەر چەندین قەلاْدا گرت کەدەتوانین ناوی جەبەل باوکی مالك و قەلاْی ئەرمەنین و قەلاْی موشاعە ناو ببەین. پێنج مانگ بەمشێوەیە بەردەوام بوو تا ئەوەی خەفاجە کوڕی سوفیان بوو بەفەرمانڕەوای سیسیل و لەجومادی الاوەلی ٢٤٨/ جولای ٨٦٢ زایینی لەئەفریقییەوە خۆی گەیاندە سیسیل. مەحمودی کوڕی لەناو یەکەم دەستەدا بوو کەڕەوانەی کرد. ئەم دەستەیە مەبەستی سەرقوسەی (سیراکوز، سەرقەستە، ساراکوزا) کرد و تالاْنی زۆری کۆکردەوە و ئەو ناوچەی وێران کرد و دواتر سوتاندی. خەڵکانی سەرقەستە رووبەرووی بوونەوە بەلاْم ئەو

سەرکەوتنی بەدەست هێنا و گەڕایەوە. خەڵکی ڕەغوس داوای ئەمانیان کرد. لەمێژووی ساڵی ٢٥٠/٨٦٤ زایینی ئاماژەی پێدراوە کەخەڵکانی ڕەغوس داوای ئەمانیان لێکرد و ئێمە لەم ساڵەدا ئاماژەی پێدەدەین و نازانین ئایا ئەمە ناسازگاریی مێژووییە یا دوو جەنگی جیاوازە و خەڵکانی ئەم دیارە ڕێگەی فێڵیان گرتۆتەبەر و خواوەند زاناترە.

لەساڵی ٢٥٠/٨٦٤ زایینی، شاری نەوتس دەستی بەسەردا گیرا. چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو: دەستەیەك لەخەڵکەکەی لەمانگی موحەرەم/ فەوریە موسوڵمانانیان لەکەلێنێك ئاگادار کردەوە کەدەیانتوانی بڕۆنە ناو شارەکە. موسوڵمانان لەم شارە تالآنی فراوانیان دەستکەوت و دوای گەمارۆ، دەستیان بەسەر شاری شەکلەدا گرت.

لەساڵی ٢٥٢/٨٦٦ زایینی، خەفاجە بەرەو سەرقەستە بەڕێکەوت و لەوێوە ڕێگەی جەبەل ئەلناری گرتەبەر. لەوێ نێردراوانی تەبەرمین هاتنە لای و داوای ئەمانیان کرد. ئەو ئەمانی پێ بەخشین و بۆ دڵگەرمی ئەوان، ژن و منداڵەکەی خۆی لەگەڵ ئەواندا نارد بەڵام ئەوان فێڵیان کرد و لەبەر ئەمە خەفاجە، محەممەدی لەگەڵ سوپایەك بۆ لەناوبردنی ئەوان ڕەوانە کرد و ئەو دەستی بەسەر تەبەرمیندا گرت و خەڵکەکەی ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا خەفاجە دووبارە بەرەو ڕەغوس بەڕێکەوت. خەڵکی ئەم دیارە لەسەر ئەو بنەمایە داوای ئەمانیان کرد کەهەر پیاوێك لەوان سامان و چوارپێکەی خۆی هەڵگرێت و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئەوی بەجێبێڵێت. ئەو ئەمانی پێدان و ئەوەی سامان و کۆیلە و شتی دیکە لەناو قەڵاکەدا مابوویەوە، تالآنی کرد. خەڵکانی غەیران و شوێنەکانی دیکە ڕێگەی سازانیان گرتەبەر. ئەو دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت بەڵام نەخۆش کەوت و بۆ بەلەرم گەڕایەوە.

لە ساڵی ٢٥٣/٨٦٧ زایینی لەبەلرەمەوە بەرەو سەرقەستە و قەتانییە بەڕێکەوت و ئەو دیارەی وێران کرد و زەوییە کشتوکاڵییەکانی پێشێل و لەگەڵ سوپاکەی بۆ سیسیل گەڕایەوە و تالآنی زۆری بەدەست هێنا.

لەبیستی ڕەبیع الاوەل٢٥٤ / نۆزدەی فەوریە٨٦٨ زایینی خەفاجە، محەممەدی

کوڕی لەگەڵ چەندین قەڵاکوت و سوپایەك بەرەو سەرقەستە ڕەوانە کرد. محەممەد تالانی زۆری بەدەست هێنا. بەمشێوەیە هەواڵ گەیشت کەسوپاسالارێك لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو قوستەنتەنییە بەرێکەوتووە. کاتێك ئەم سوپاسالارە گەیشتە سیسیل، دەستەیەك لەموسوڵمانان ڕووبەڕووی بوونەوە و شکستیان بەرۆمییەکان هێنا و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و تالانییەکی زۆریان دەستکەوت. خەفاجە بەرەو سەرقەستە بەرێکەوت و زەوییە کشتوکاڵییەکانی لەناو برد، تالانییەکانی کۆکردەوە و بۆ بەلەرم گەڕایەوە.

لەسەرەتای مانگی ڕەجەب/ سێپتامبەری ئەم ساڵە محەممەدی کوڕی لەرێگەی دەریاوە بۆ غیتە نارد. محەممەد گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە و سوپاکەی خۆی بڵاوە پێکرد. ئەو کەشتییەکانی لەتالانییەکان پڕ کرد و لەمانگی شەوال، دێسامبەر بۆ بەلەرم گەڕایەوە. لەساڵی ٨٦٩/٢٥٥ خەفاجە، محەممەدی کوڕی بۆ تەبەرمین ڕەوانە کرد کە لەجوانترین شارەکانی سیسیل بوو. محەممەد لەمانگی سەفەر/ ئاوریل بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت. لەو کاتەدا کەسێك هاتبووە لایان و مژدەی پێدابوون کەکەلێنێك بۆ ڕۆشتنە ناو شارەکەیان نیشان دەدات. خەفاجە ئەوی لەگەڵ کوڕەکەی نارد. کاتێك لەو دیارە نزیك کەوتنەوە، محەممەد کشایەوە و ژمارەیەك لەسەربازەکانی لەگەڵ ڕێنیشاندەرەکان ڕەوانە کرد. ئەوان ڕۆشتنە ناو شارەکە و و دەروازە و دیواری شارەکەیان گرت و ئەسیر کردن و کۆکردنەوەی تالانییان دەست پێکرد. محەممەد مناڵی خەفاجە لەگەڵ سوپاکەی دواتر هاتە ناو شارەکە و ئەم درەنگ کەوتنە ئەو گومانەی لای سوپای ناوشار دروست کرد کە محەممەد گرفتار بووە و لەسەر ئەم گومانە ناڕاستە کۆیلەکانیان ئازاد کرد و بەخێرایی لەشارەکە هەڵاتن و کاتێك محەممەد و سوپاکەی لەدەروازەی شارەکە نزیك بوونەوە، موسوڵمانانی لەوێ نەبینی و ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.

لەرەبیع الاوەل/ مەی ئەم ساڵە، خەفاجە ڕێگەی مەرسیەی(مورسیا مورگی) گرتەبەر و کوڕەکەی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ سەرقەستە ڕەوانە کرد. دوژمنەکەی بەسوپاکەیەکی گەورە ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕێکی قورس دەستپێکرد و موسوڵمانان هێزیان نەما و ژمارەیەکیان کوژران و بۆ لای خەفاجە

گەڕانەوە و ئەو ڕێگەی سەرقەستەی گرتەبەر و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و لەوێ مایەوە و بارودۆخی لەخەڵکەکەی دژوار کرد. دواتر ئەو شارەی وێران کرد و زەوییە کشتوکاڵییەکانی لەناو برد و ڕێگەی بەلەرمی گرتەبەر و گەیشتە وادی تین و شەوانە لەوێ ڕۆشت بەڵام لەم کاتەدا سەربازێکی سوپاکەی بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر و بریندار کرد کەبووە هۆی مردنی. ئەم پێشهاتە لەسەرەتای ڕەجەب/ سێپتامبەر ڕوویدا. بکوژەکەی بۆ سەرقەستە هەڵات. جەنازەی خەفاجەیان بۆ بەلەرم برد و لەهەمان شوێن بەخاکیان سپارد و دوای ئەو محەممەد کوڕی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. فەرمانڕەوایەتی محەممەدیان بۆ فەرمانڕەوای ئەفریقییە نووسی و ئەو بەفەرمانڕەوایەتی محەممەد ڕازی و فەرمان و خەڵاتی بۆ نارد.

## فەرمانڕەوایی محەممەد کوڕی خەفاجە

کاتێك خەفاجە کوژرا، خەڵك، محەممەدی کوڕیان وەك فەرمانڕەوا هەڵبژارد و محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەب، پاشای قیروان، بەفەرمانڕەوایەتی ئەو ڕازی بوو. محەممەد لەساڵی ٢٥٦/ ٨٧٠ زایینی هێرشی کردە سەر ماڵتە کەرۆمییەکان گەمارۆیان خستبوویە سەر. کاتێك ڕۆمییەکان لەهێرشیەکەی محەممەد ئاگادار بوونەوە، شارەکەیان بەجێهێشت.

لەرەجەبی ساڵی ٢٥٧/ مەی ٨٧٠ زایینی، خزمەتکارە خەساوەکان، محەممەدیان کوشت و هەڵاتن. خەڵکان شوێنیان کەوتن و ئەوانیان دەستگیر و خوێنیان ڕشتن.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مونتەسیر یەك ڕۆژ دوای خەلافەتی خۆی، باوکی عەمرە، ئەحمەد کوڕی سەعید، موالی منداڵەکانی هاشمی بۆ لێکۆڵینەوە لەکاروباری ستەملێکراوان ڕاسپارد. شاعیرێك لەمبارەوە وتوویەتی:

يا ضيعة الاسلام لما ولی　　　　مظالم الناس ابو عمره

صیر مأمونا علی امة                    و لیس مامونا علة بعره

واتاکەی: هاوار لەئیسلام ئەو کاتەی باوکی عەمرە بۆ لێکۆڵینەوە لەکاروباری ستەملێکراوان راسپێردرا. کرایە ئەمینی ئۆمەتێك لەکاتێکدا نەدەبوا بکرایە بەئەمینی پشقلێك.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سلێمانی زەینەبی ریّ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و عیسا کوڕی محەممەدی نەوشەری فەرمانڕەوایی دیمەشقی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا سوپایەك لەموسوڵمانانی ئاندۆلۆس هێرشیان کردە سەر بارسەلۆنا لەفەرەنگ و شەڕیان لەگەڵ خەڵکەکەی کرد. فەرمانڕەوای ئەم شارە نامەیەکی بۆ فەرمانڕەوای فەرەنگ نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. فەرمانڕەوای فەرەنگ سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری ئەو نارد. موسوڵمانانیش نامەیەکیان نووسی و داوای هاوکارییان کرد و هاوکارییان بۆ گەیشت. موسوڵمانان هاتنە ناو بارسەلۆنا و لەنێوان هەردوو سوپا شەڕێکی قورس روویدا. موسوڵمانان توانیان دەست بەسەرە زەوییەکانی دەوروبەری شار و دوو بورج لەبورجەکانی شار بگرن. لەناباوەڕانی ئەم شارە ژمارەیەکی زۆر کوژران بەڵام موسوڵمانان زیانیان بەرنەکەوت و لەگەڵ تالانییەکان گەڕانەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی عوسمان بەکر کوڕی محەممەدی مازنی، نەحوی عەرەبی، کە لەزمانی عەرەبی بەپێشەوا دادەنرێت، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و هەشتی کۆچی (٨٦٢ زایینی)

## جەنگەکانی وەسیف لەگەڵ ڕۆم

لەم ساڵەدا مونتەسیر، وەسیفی تورکی بۆ جەنگ لەسەرزەمینەکانی ڕۆم ڕەوانە کرد.

هۆکاری ئەم جەنگە، ڕق و دوژمنایەتی وەسیف و ئەحمەد کوڕی خەسیب بوو. ئەحمەد کوڕی خەسیب، مونتەسیری دژی وەسیف هەڵخراند و داوای لێکرد بەبیانوی جەنگ ئەو لەسوپاکەی خۆی دەربکات. مونتەسیر، وەسیفی بانگ کرد، کاتێك هات پێی وت: ئاگادار بووینەتەوە کە یاخییەکانی ڕۆم مەبەستی هێرش کردنە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکانیان کردووە و ئەم بارودۆخێکە ناتوانین لێی بێ ئاگا بین. دەترسم ئەوان هەموو شتەکانی سەر ڕێگە لەناو ببەن و خوێنی موسوڵمانان بڕێژن و ئەسیریان بکەن، کەواتە ئێستا تۆ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە دەڕۆیت یا من؟ وەسیف وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! خۆم دەڕۆم. مونتەسیر ڕووی کردە ئەحمەد کوڕی خەسیب و پێی وت: بزانە نیازەکانی وەسیف چییە و دابینی بکە. ئەحمەد وتی: فەرمانەکەت جێبەجێ دەکرێت سەروەری باوەڕداران. مونتەسیر وتی: بەو شێوەیە نابێت، هەرئێستا بڕۆ، دواتر بەوەسیفی وت: بەدەبیرەکەت بڵێ تا بەدیهێنانی هەموو نیازەکانت هاوڕێی ئەحمەد بێت. هەردووك هەستان. ئەحمەد کوڕی خەسیب سەرقاڵی بەدیهێنانی نیازەکانی وەسیف بوو، دواتر هاتن تا وەسیف شاسوارەکانی خۆی هەڵبژێرێت. دوانزە هەزار جەنگاوەر لەم جەنگەدا هاوڕێیەتیان دەکرد و موزاحیم کوڕی خاقان برای فەتح کوڕی خاقان، پێشەنگی ئەوان بوو. مونتەسیر نامەیەکی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر لەبەغداد نووسی و ئەوی لەم ڕووداوە ئاگادار کردەوە و فەرمانی پێدا خەڵکان بۆ بەشداری کردن لەم جەنگە هان و پەیوەستی وەسیفیان بکات. مونتەسیر فەرمانی بەوەسیفدا بەرەو سنورەکانی مەڵتییە بڕوات. مونتەسیر، باوکی وەلید حەریری بەجەلی وەك لێپرسراوی خەرجی سوپاکە و سەرپەرەستی تالأنییەکان دەستنیشان کرد. کاتێك وەسیف بەرێکەوت، مونتەسیر، فەرمانێکی بۆ نووسی بۆ ئەوەی چوار ساڵ لەسنورەکان بمێنێتەوە و لەکاتی جەنگ بجەنگێت و چاوەڕوانی فەرمان بێت.

## چۆنیەتی لەسەرکار لابردنی موعتەز و مۆئەییەد

لەم ساڵەدا موعتەز و مۆئەییەد دوو منداڵەکەی متوەکیل لەجێگری خەلافەت دوورخرانەوە. هۆکاری دوورخرانەوەی ئەوان ئەمە بوو: کاتێك بارودۆخ بۆ مونتەسیر سەقامگیر بوو، ئەحمەد کوڕی خەسیب بەوەسیف و بوغای وت: ئێمە لەپێشهاتەکانی ڕۆژگار لەئەماندا نین، ئەگەری هەیە سەروەری باوەڕداران بخەوێت و بڕواتە خەوێکی هەمیشەیی و خەلافەت بۆ موعتەز بمێنێتەوە و ڕەگ و ڕیشەی ئێمە لەناو ببات و هیچمان لێ نەهێڵێتەوە. دەبێت بۆ دوور خستنەوەی ئەوان هەوڵ بدەین.

تورکەکان لەسەر ئەم وتەیە پێداگرییان کرد و لای مونتەسیر بەردەوام قسەیان کرد و وتیان: ئێمە ئەم دووانە لەخەلافەت دوور دەخەینەوە و دەستی منداڵەکەی تۆ، عەبد وەهاب وەك جێگری خەلیفە دەگرین. بەرادیەك پێداگرییان کرد کەمونتەسیر ڕازی بوو و چل ڕۆژ دوای خەلافەتی خۆی، موعتەز و مۆئەییەدی بانگ کرد و هەردووکیانی لەماڵێکدا دانا. موعتەز بەمۆئەییەدی وت: براکەم، ئەو ئێمەی بانگ کردووە تا لەجێگری خەلافەت دوورمان بخاتەوە. مۆئەییەد وتی: گومان ناکەم ئەو کارە بکات.

سەرقاڵی ئەم گفتوگۆیە بوون کەپەیك هەواڵی دوورخرانەوەی ئەوانی هێنا. مۆئەییەد وتی: من گوێرایەڵم. موعتەز وتی: من گوێرایەڵ نیم. کەواتە ئەگەر دەتانەوێت بمکوژن، دوو دڵ مەبن. مونتەسیریان لەوتەکانی موعتەز ئاگادار کردەوە و دواتر گەڕانەوە و موعتەزیان لەناو ژوورێکدا زیندانی کرد و دەرگایان لەسەر داخست. کاتێك مۆئەید ئەمەی بینی، بەدڵی پڕ و بۆ سەرکۆنە کردن پێی وتن: ئەمە چ کردارێکە ئەی سەگینە! ئێوە دەستتان بەخوێنی ئێمە پیس دەکەن و بەم شێوەیە هێرش دەکەنە سەر سەروەری خۆتان! ڕێگە بدەن قسەی لەگەڵ بکەم. ئەوان بێدەنگ بوون و دوای وەرگرتنی مۆڵەت لەمونتەسیر، هەردووکیان لەیەك شوێندا زیندانی کرد.

مۆئەییەد هاتە لای موعتەز و پێی وت: ئەی نەزان! دەبینی بەو شێوەیە جوێن

بەباوکت دەکەن هێشتا خۆڕاگری دەکەیت؟ هاوار لەتۆ، خۆت لەسەر کار لابەرە و قسەیان لەگەڵ مەکە. موعتەز وتی: چۆن لەگەڵ ئەوەی لەهەموو ناوچەکان من وەك جێگری خەلیفە دەناسن، خۆم لەسەر کار لاببەم؟ مۆئەییەد وتی: ئەمە ئەو شتەیە بووە هۆی کوشتنی باوکی تۆ و تۆیش بەکوشتن دەدات، ئەگەر خواوەند دیاری کردبێت، خەلافەت بگریتە دەست، خەلافەت دەگریتە دەست. موعتەز وتی: ئەو کارە دەکەم.

مۆئەییەد هاتەدەر و وتی: ئەو رازی بووە لەخەلافەت دوور بخرێتەوە. ئەوان ڕۆشتن و مونتەسیریان ئاگادار کردەوە و گەڕانەوە و سپاسی موعتەزیان کرد. دەبیرێکیان لەگەڵدا بوو. ئەو دانیشت و بەموعتەزی وت: بەخەتی خۆت، فەرمانی دوور خرانەوەی خۆت بنووسە. موعتەز بەم کارە رازی نەبوو. مۆئەییەد بەدەبیرەکەی وت: کاغەز بێنە. ئەوەی دەتەوێت، بیڵێ تا من بینوسم. دەبیر وتی نامەیەك بۆ مونتەسیر بنوسێت و لەناتەوانی خۆی بۆ خەلافەت ئاگاداری بکاتەوە و بڵێت کەخەلافەت بۆ ئەو ڕەوا نییە و ئەوەی حەز ناکات لەبەر ئەوەی شیاو نییە، گوناح بخاتە ئەستۆی متوەکیل و خۆی بەردەوام داوای لەمتوەکیل کردووە ئەم کارە بەو نەسپێرێت و بەباوکی وتووە کە خۆی لەسەر کار لابردووە و بەیعەتی خەڵکانی لەسەر شان نییە. مۆئەییەد ئەمانەی نووسی و بەموعتەزی وت: تۆیش ئەم وتانە بنووسەرەوە. موعتەز رازی نەبوو. مۆئەییەد وتی: هاوار لەتۆ، بینوسە. موعتەز نووسی و دەبیر ئەوانی بەجێهێشت. دواتر هەردووکیانی بردە لای مونتەسیر. مونتەسیر ئەم دوانەی دانیشاند و پرسی: ئایا ئەمە نامەی ئێوەیە؟ وتیان: بەڵێ ئەی سەروەری باوەڕداران. دواتر مونتەسیر لەکاتێکدا تورکەکان وەستا بوون، وتی: ئایا ئێوە باوەڕتان وایە لەبەر تەماحکاری ئێوەم لەسەر کار لابردووە تا زیندوو بمێنم بۆ ئەوەی مناڵەکەم گەورە ببێت و خەلافەت بەو بسپێرم؟ سوێند بەخوا هیچ کات بیرم لەتەماحی لەو شێوە نەکردۆتەوە، سوێند بەخوا ئەوەی کوڕەکانی باوکم خەلافەت بگرنە دەست بۆ من خۆشترە لەوەی ئامۆزەکانم خەلافەت بگرنە دەست بەڵام ئەوان (موالییەکان) بەرادەیەك پێداگرییان کرد کەترسام ئەگەر رازی نەبم یەکێك لەوان گورزێك لەئێوە بوەشێنێت، ئەوسا دەبێت چی بکەم؟ تۆڵە

لەبکوژەکەی ئێوە بکەمەوە؟ سوێند بەخوا خوێنی هەموویان هاوسەنگی خوێنی یەکێك لەئێوە نییە و لەبەر ئەمە رازی بوون بەداوکاری ئەوان بۆ من ئاسانتر بوو. موعتەز و مۆئەییەد دەستیان ماچ کرد و مونتەسیر لەئامێزی گرتن. دواتر قازییەکان، منداڵەکانی هاشم، سەرکردەکانی سوپا و گەورەکانیان بۆ دوور خستنەوەی خۆیان کردە شایەت. مونتەسیر ئەم هەواڵەی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر وکەسانی دیکە نووسی.

## مەرگی مونتەسیر

لەیەکشەممە یا بەگومانێك شەممە، پێنجی رەبیع الاخر، نۆی جونی ئەم ساڵە، مونتەسیر مرد. نازناوی ئەو باوکی جەعفەر ئەحمەد کوڕی متوەکیل عەلی الله یا بەگومانێك باوکی عەباس یا عەبدوللە بوو.

هۆکاری مەرگی ئەو خوناق، ئاوساوی قورگ بوو کە لەرۆژی پێنجشەممە، بیست و پێنجی رەبیع الاوەل، سی مەی یەخەی گرت. دەستەیەك مەرگی ئەو بەهۆی ئاوسانی گەدەی دەزانن کەسەرەئەنجام لەدڵیدا. ئەم نەخۆشییە سێ رۆژ درێژەی کێشا.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە، گەرمای جەستەی زیادی کرد و یەکێك لەپزیشکەکانی بانگ کرد. پزیشك دەرزی ژەهراوی لێدا و مونتەسیر بەهۆیەوە مرد. ئەو پزیشکەی مونتەسیری کوشت، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵ، هەستی بەگەرمایەکی زۆر لەجەستەی کرد و داوای لەقوتابییەکەی کرد دەرزی لێ بدات. ئەو دەرزییەکانی خستە بەردەم قوتابییەکە و پێی وت باشترینیان هەڵبژێرێت. قوتابی هەمان دەرزی ژەهراوی هەڵگرت و لێیدا. کاتێك کۆتایی بەکارەکەی هێنا، پزیشك سەیری دەرزییەکانی کرد و دەرزییە ژەهراوییەکەی ناسییەوە و لەمەرگی خۆی دڵنیا بوو. دەستبەجێ وەسیەت نامەی خۆی نووسی.

هەروەها دەڵێن: مونتەسیر هەستی بەئازار لەسەری کرد و کوڕی تەیفور لەگیراوەیەك چەند قەترەیەکی کردە گوێچکەی و بەهۆیەوە سەری مونتەسیر ئاوسا و مرد.

دەستەیەك دەڵێن: کوڕی تەیفور بەشاخێکی ژەهراوی، کەڵەشاخی بۆ کرد.

هەروەها دەڵێن: ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەکاتی خەلافەتی ئەو تا کاتی مەرگ دەیانوت: فراوانی ژیانی ئەو شەش مانگ زیاتر نابێت چوونکە فراوانی ژیانی شیرویە کوڕی کەسرا بکوژی باوکی زیاتر لەشەش مانگ نەبوو. ئەمە وتەی سەر زاری هەمووان بەتایبەت گەورەکان بوو.

هەروەها دەڵێن: رۆژێك کە لەجێگەکەی خەوتبوو، بەدەم گریان لەخەو راچەنی، عەبدوللە کوڕی عومەری بازیاری دەنگی گریانی ئەوی بیست، ڕۆشتە لای و لەهۆکاری گریانەکەی پرسی. مونتەسیر وتی: لەخەودا بینیم متوەکیل هاتە لام و وتی: هاوار لەتۆ ئەی محەممەد! منت کوشت و ستەمت لەمن کرد و بەفێڵ دەستت بەسەر خەلافەتدا گرت، سوێند بەخوا دوای من زیاتر لەچەند رۆژ لەسەر تەختی خەلافەت دانانیشیت و دواتر بەرەو ئاگر دەڕۆیت. عەبدوللە وتی: ئەمە خەوێکە ئەگەری هەیە راست یا ناڕاست بێت، هیوادارم خواوەند تەمەن درێژ و شادمانت بکات. کەمێك بخۆرەوە و خۆش رابوێرە و گرنگی بەهیچ مەدە. مونتەسیر ئەو کارەی کرد بەڵام تا کاتی مەرگ پەرێشان بوو.

دەستەیەکی دیکە دەڵێن: دەگێڕنەوە کەمونتەسیر سەبارەت بەکوشتنی باوکی لەگەڵ دەستەیەك لەزانا ئایینییەکان راوێژی کرد و لەدوژمنی باوکی لەگەڵ بنەماڵەی عەلی و کارە قێزەونەکانی ئەو ئاگاداری کردنەوە و وتی: لەگێڕانەوەیان شەرم دەکەم. ئەوان فتوایان بۆ کوشتنی ئەودا و ئەوەی لێکەوتەوە کەدەزانین.

مونتەسیر بیست و پێنج ساڵ و شەش مانگ یا بیست و چوار ساڵ ژیا و شەش مانگ و دوو رۆژ یا شەش مانگی تەواو فەرمانڕەوایەتی کرد. لەسامەرا کۆچی کرد و کاتێك فریشتەی مەرگ یەخەی گرت، وتی:

و ما فرحت نفسی بدنیا اخذتها     و لکن الی الرب الکریم اصیر

واتاکەی: ئەو جیهانەی دەستم بەسەردا گرت، شادمانی نەکردم و هەنووکە بۆ بارەگای خواوەند دەگەڕێمەوە (بەڵام لەوە شادمانم کەسەرئەنجامی کار گەڕانەوە بۆ لای خواوەندی میهرەبانە)

ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موعتەسەم لەسامەرا نوێژی لەسەر جەستەی ئەو

خوێند. مونتەسیر لەم شارەدا چاوی بەدنیا هەڵهێنا. چاوەکانی گەورە و ڕەش، کورتە باڵا و روخسارێکی سەنگینی بوو. مونتەسیر یەکەم خەلیفەی عەباسییە کەگۆڕەکەی بەدەرەوەیە چوونکە دایکی کەدایکی مناڵ و ڕۆمی بوو، دەیویست گۆڕەکەی بەدەرەوە بێت.

## کردە و کردەوەکانی مونتەسیر

مونتسیر، خۆڕاگر، چاکەکار، خوازیاری چاکە، بەخشندە، دادپەروەر و هەڵس و کەوتی جوان بوو. فەرمانی بەخەڵکان دەدا سەردانی ئارامگای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و حسەین کوڕی عەلی بکەن. عەلەوییەکان لەرۆژگاری ئەو ئاسوودە بوون و لەرۆژگاری باوکی بەدبەخت و ترساو. ئەو زەوی و سامانی عەلەوییەکانی گەڕاندەوە و فەدەکی بەمناڵەکانی حەسەن و حسەین دوو کوڕەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سپارد.

دەگێڕنەوە یەکەم کاری مونتەسیر دوای هاتنە سەر کار، دوور خستنەوەی ساڵح کوڕی عەلی لەمەدینە و دانانی عەلی کوڕی حسەین کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەباس کوڕی محەممەد وەك فەرمانڕەوای ئەو شارە بوو.

عەلی کوڕی حسەین دەڵێت: کاتێك بۆ ڕۆشتن بۆ سنووری فەرمانڕەوایەتی ڕۆشتمە بارەگای مونتەسیر، پێی وتم: ئەی عەلی، من تۆ بۆ لای گۆشت و خوێنی خۆم دەنێرم، کەواتە بەشێوەیەکی چاك هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکە. مەبەستی لەم وتەیە بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. عەلی وتی: هیوادارم فەرمانەکانی سەروەری باوەڕداران بەجوانترین شێوە ئەنجام بدەم. مونتەسیر وتی: بەمشێوەیە لای من کەسێکی بەختەوەر دەبیت.

ئەمە یەکێك لەوتەکانی ئەوە: سوێند بەخوا هەرگیز ئەوەی ناڕەوا دەپەرەستێت، ڕێزداری بەدەست ناهێنێت تەنانەت ئەگەر مانگ لەناوچاوییەوە هەڵبێت و هەرگیز ئەو کەسەی ڕاستییەکان دەپەرستێت، ریسوا نابێت تەنانەت ئەگەر جیهانییەکان دژی ئەو یەك بگرن.

## خەلافەتی موستەعین

لەم ساڵەدا لەگەڵ ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موعتەسەم وەك خەلیفە بەیعەتیان بەست.

چۆنیەتی ئەم کارە بەو شێوە بوو: بەیانی رۆژی دوای مونتەسیر، موالییەکان لەهارونییە کۆبوونەوە. بوغای گەورە و بوغای بچوك و ئوتامش لەناویاندا دەبینران. ئەحمەد کوڕی خەسیب بەچارەگەری خۆی سەرکردەکانی تورك و مەغریب و ئەشروسنەی سوێنددا بەهەرکەس بوغای گەورە و بوغای بچوك و ئوتامش رازی بوون، رازی بن. ئەوان لەناو خۆیاندا راوێژیان کرد و سوێندیان خوارد بەلأم حەزیان نەدەکرد یەکێك لەمناڵەکاتی متوەکیل خەلافەت بگرێتەدەست تا نەکا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ئەوان لەناو ببات (چوونکە ئەوان متوەکیلیان کوشتبوو) هەمووان بۆ خەلافەتی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موعتەسەم رازی بوون و وتیان: خەلافەت لەناو مناڵەکانی سەروەری ئێمە موعتەسەم نابێت بڕواتەدەر. بەم پێیە لەشەوی دووشەممە لەشەشی رەبیع الاخر/ دەی جون لەگەڵ ئەو بەیعەتیان بەست کەبیست و هەشت ساڵ تەمەنی بوو. نازناوی باوکی عەباسە.

موستەعین، ئەحمەد کوڕی خەسیبی وەك دەبیر و ئوتامشی وەك وەزیری خۆی دیاریکرد.

لەرۆژی دووشەممە، موستەعین بەجل و بەرگی خەلافەت بەرەو دار ئەلعامە بەرێکەوت و ئیبراهیم کوڕی ئیسحاق لەبەرابەر ئەو نیو ڕمی دەبردە پێش و واجنی ئەشروسنی سەربازەکانی لەدوو ریزدا رازاندەوە و لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی لەبەرابەری وەستا. سەرکردە عەباسییەکان و تالبییەکان و دەستەیەکی دیکە لەناو کۆشکی خەلافەتدا بوون.

هەمووان لەم حاڵەدا بوون کە لەناکاو لەناو گەڕەك و کۆڵأنەکانەوە دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە. لەم کاتەدا پەنجا شاسوار بینرا کەدەیانوت لەهاوەڵانی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیرن و دەستەیەك لەخەڵکانی بازار و ئاژاوە گێران هاوڕێیەتیان دەکردن. ئەوان شمشێریان دەرکێشا و هاواریان دەکرد: کۆکردنەوە،

ئەی مەنسور. هێرشیان کردە سەر سەربازەکانی ئەشروسنی و جەنگیان دەستپێکرد. دەستەیەك لەسپی پۆشەکان و شاکرییەکان کە لای باب ئەلعامە بوون، هاتن و ژمارەیان زیادی کرد. لەم کاتەدا مەغربییەکان و ئەشروسنییەکان هێرشیان کردە سەریان وتا دەروازەی زەرافە پاشەکشێیان پێکردن و لەوێ سەر لەنوێ جەنگیان دەستپێکردەوە و دەستەیەك کوژران. سێ کاژێر دواتر تورکەکان و هاشمییەکان و ئەو کەسانەی بەیعەتیان بەموستەعیندا بوو، لەکۆشك گەڕانەوە.

لەم کاتەدا دووبارە شۆڕشگێڕەکان هێرشیان کردە سەر دار ئەلعامە و کەرەستەکانی جەنگ و زرێ و شمشێر و قەڵغانەکانیان تالان کرد. ئەوانەی ئەم تالانییەیان کرد، شۆڕشگێڕەکان، گەرماوچییەکان، پاقلاوە فرۆشەکان و بیرەفرۆشەکان بوون. بوغای گەورە لەگەڵ دەستەیەك هێرشی کردە سەریان و ئەوانی لەجبەخانەکە دوور کردەوە و ژمارەیەکی لێ کوشتن. هەردوو لا ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا. لەم بگرە و بێنەدا زیندانییەکانی سامەرایش شۆڕشیان کرد و چەند کەسێك هەلاتن. لەم کاتەدا بۆ بەیعەت بەخششیان دیاری کرد و بەیعەت نامەیان بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر نارد و ئەو لەگەڵ بەغدادییەکان بەیعەتیان بەموستەعیندا.

کوڕی مەسکویە لەکتێبی تجارب الامم دەڵێت کەموستەعین لەباوکەوە برای متوەکیل بوو بەلاّم ئەوە راست نییە بەڵکو موستەعین کوڕی برای ئەو محەممەد کوڕی موعتەسەم بوو و خواوەند زاناترە.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەرەجەب/ ئوتی ئەم ساڵە، هەواڵی مەرگی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر لەخوراسان بەموستەعین گەیشت و ئەو کوڕی تاهیر محەممەد کوڕی تاهیری کردە فەرمانڕەوای خوراسان و محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیری لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی عێراق دانیشاند و حەرەمین (مەککە و مەدینە) و فەرماندەیی پاسەوانەکان و سەرپەرەستی سوادی عێراقی پێسپارد تا خۆی بەتەنیا بەرێوبەری ئەو ناوچانە بێت.

لەم ساڵەدا بوغای گەورە مرد و موستەعین، هەموو ئەرك و پێگەی بوغای بەموسای کوڕی بوغا سپارد و هەروەها وەك سەرپەرەستی بەرید دەستنیشانی کرد.

لەم ساڵەدا ئەنوجوری تورك بۆ جەنگ لەگەڵ باوکی عەمودی سەعلەبی ڕەوانە کرا. ئەو باوکی عەمودی لەبیست و پێنجی رەبیع الاوەل، سی مەی لەکەفەرتوسی کوشت.

لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی یەحیا کوڕی خاقان مەبەستی حەجی کرد بەڵام سوپایەك ڕەوانە کرا کەگرتیان و دووریان خستەوە و نەیانهێشت حەج بکات. ئەویان لەشوێنی بەرقە گرت.

لەم ساڵەدا موستەعین هەموو سامان و زەوییەکانی موعتەز و مۆئەییەدی کڕییەوە و قازی و فەقیهەکانی کردە شایەت. فرۆش بە ناوی حەسەن کوڕی موخەلەد بۆ موستەعین بوو. موستەعین بەرادەیەك پارەی بەموعتەزدا کەداهاتی ساڵانەی بیست هەزار دینار بوو و بۆ مۆئەییەد بەڕادەیەك کەداهاتی ساڵانەی پێنج هەزار دینار بوو. دواتر ئەوانی لەژوورێك لەجوسق زیندانی کرد و پاسەوانی بۆ دانان. تورکەکان لەسەرەتای شۆڕشی خەلافەتی موستەعین مەبەستی کوشتنی ئەو دوانەیان کرد بەڵام ئەحمەد کوڕی خەسیب ڕێگەی لێگرتن و وتی: ئەم دوانە هیچ تاوانێکیان نییە، دەبێت ئەوان زیندانی بکرێن و زیندانی کران.

لەجومادی الاخرە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە موالییەکان ڕقی ئەحمەد کوڕی خەسیبیان لەدڵ گرت و دەستیان بەسەر سامانی خۆی و منداڵەکانیدا گرت و خۆی بۆ ئەقریتش (ئەقریتس، کریت) دوور خرایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی لەسنورەکانی شام گەڕێنرایەوە و فەرمانڕەوایی ئازەربایەجان و ئەرمەنستانی لەمانگی رەمەزان/ ئۆکتۆبەر پێ سپێردرا.

هەروەها لەم ساڵەدا خەڵکانی حیمس دژی کارگوزارەکەی خۆیان کەیدەر شۆڕشیان گرت و ئەویان دەرکرد. موستەعین، فەزڵ کوڕی قارنی بۆ لای ئەوان نارد. ئەو شۆڕشیەکانی کرد و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و سەد کەس لەگەورەکانی ئەوانی ڕەوانەی سامەرا کرد.

لەم ساڵەدا وەسیف لەهاویندا جەنگی کرد. ئەو کە لەسنورەکانی شام مابوویەوە، ڕێگەی ڕۆمی گرتەبەر و دەستی بەسەر قەڵای فەروریەدا گرت.

لەمساڵەدا موستەعین، میسر و مەغریبی خستە ژێر فەرمانی ئوتامش و ئەوی وەك وەزیری خۆی دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا موستەعین، حولوان، ماسەبزان و مێهرجانقەزەقی خستە ژێر فەرمانی بوغای شەرابی و شاهەکی خزمەتکاری وەك فەرماندەی کۆشکەکەی و خەراجی چوارپێکان و حەرەمسەراکەی و پاسەوانەکان و کارە تایبەتییەکانی خۆی دەستنیشان کرد. پێگەی ئەو و ئوتامشی لەهەموان زیاتر بەرز کردەوە.

محەممەد کوڕی سلێمانی زەینەبی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەمرۆ کە لەرۆژگاری مونتەسیریش بانگی (لا حکم الا الله (داوەرێك جگە لەخوا نییە، دروشمی خەواریج بەمانای دەرچوون و حاشا کردنی خەلافەت) بەرز دەکردەوە، سەر لەنوێ دەستی بەم کارەی کردەوە و ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر. لەکەنارەکانی موسڵ پیاوێکی خەوارجی دیکە ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. موستەعین، ئیسحاق کوڕی سابتی فەرغانی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. ئەو ئەم خارجییە و شوێنکەوتەکانی ئەسیر کرد و لەداریدان و جەستەیانی چوارمێخە کێشا.

هەروەها لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیسی سەفاری لەسەجستان (سیستان) هێرشی کردە سەر هەرات.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی عەدویە باوکی محەممەدی رافعی خۆپارێز کەدۆعاکانی گیرا دەبوو، مرد. ئەو یەکێك لەخەڵکانی ئەفریقییە بوو.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەئاندۆلۆس بەرەو زی تەرجو ڕۆشتن. ناباوەڕان هێرشیان کردبووە سەر ئەم ناوچەیە. ئەم دەستەیە ڕووبەڕوویان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن.

لەم ساڵەدا سوپای موسوڵمانان لەسیسیل بێ ئەوەی شەڕێکی ئەوتۆ ڕوویدات، سەرکەوتنی بەدەست هێنا و تالآنی زۆری دەستکەوت و گەڕایەوە.

لەجومادی الاخر/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە باوکی کورەیب محەممەد کوڕی عەلای هەمەدانی کوفی لەمامۆستاکانی بوخاری و موسلیم مرد. هەروەها محەممەد کوڕی حەمیدی رازی حەدیس بێژ کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و چل و نۆی کۆچی (٨٦٣ زایینی)

## جەنگ لەگەڵ ڕۆمییەکان و کوژرانی عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی دینار جەنگی هاوینەی کرد و دەستی بەسەر قەڵایەك و چەندین سەنگەردا گرت.

عومەر کوڕی عوبەیداللەی ئەقتەع داوای مۆڵەتی لێکرد تا هێرش بکاتە سەر ڕۆم. جەعفەر مۆڵەتی پێدا. بەم شێوەیە عومەر لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەخەڵکانی مەڵتییە ڕوی کردە ڕێگەی ڕۆم. پاشای ڕۆم لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەمەرجی ئەسقوف ڕووبەڕووی عومەر بوویەوە و شەڕێکی قورس ڕوویدا و ژمارەیەکی فراوان لەهەر دوو سوپا کوژران. دواتر ڕۆمییەکان کەژمارەیان پەنجا هەزار کەس بوو، دەوری موسوڵمانانیان گرت و عومەر لەگەڵ دوو هەزار سەرباز، لەنیوەی ڕەجەب/ پێنجی سێپتامبەر کوژران. کاتێك عومەر کوڕی عوبەیدالله کوژرا، ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی جەزیرە و دەستدرێژیان بۆ سەر سامان و ناموسی موسوڵمانان کرد. عەلی کوڕی یەحیا کاتێك لەگەڵ خەڵکانی مەیافارقین و سیلسیلە لەئەرمەنستان دەگەڕایەوە، ئەم هەواڵەی پێگەیشت و بەخێرایی بۆ هێرش کردنە سەر ڕۆمیەکان ئەسپی غاردا بەڵام لەمانگی ڕەمەزان/ ئۆکتۆبەر لەگەڵ چوارسەد سەرباز، کوژران.

## شۆڕشی بەغداد

لەم ساڵەدا سوپاییەکان و شاکرییەی بەغداد شۆڕشیان کرد. هۆکارەکەی بیستنی هەواڵی کوژرانی عەلی کوڕی یەحیا و عومەر کوڕی عوبەیدالله بوو. ئەم دوانە لەجەنگاوەرە بوێرە ناودارەکان بوون و بۆ پاسەوانی کردنی سنوورە ئیسلامییەکان هەوڵی زۆریاندا بوو. کوژرانی ئەم دوانە لەدوای یەك لای ئەوان گران و ناخۆش بوو، جیاواز لەوە تورکەکان کەمتوەکیلیان کوشتبوو، جڵەوی کاروبارەکانیان لەدەست گرتبوو و بێ هیچ نیگایەك بەدین و خواستی موسوڵمانان خەلیفەیەکیان لەسەر کار لادەبرد یا دەیانهێنایە سەر کار. لەسەر ئەم بنەمایە،

کۆمەلآنی خەڵکی بەغداد دەنگیان بەرز کردەوە و ئەبنا و شاکرییەکان کەوایان نیشان دەدا داوای مانگانەی خۆیان دەکەن، پەیوەستیان بوون. ئەم رووداوە لەیەکەم رۆژی سەفەر/ بیست و شەشی مارس روویدا. ئەوان دەرگای زیندانەکانیان کردەوە و زیندانییەکانیان ئازاد کرد و یەك دوو پردیان سووتاند و پردێکی دیکەیان رووخاند و ماڵی بیشر و ئیبراهیم دوو منالەکەی هارون کەدەبیری محەممەد کوڕی عەبدوللە بوون، تالآن کران. دەوڵەمەندەکانی بەغداد و سامەرا سامانەکانیان هێنایەدەر و بەناو خۆبەخششەکان بۆ جەنگ لەگەڵ رۆمییەکان دابەشیان کرد. هەموان بۆ جەنگ لەگەڵ رۆمییەکان لەکێوەکان، فارس و ئەهواز و سەرزەمینەکانی دیکەوە هاتن بەلآم خەلیفە لەمبارەوە نەفەرمانیدا نەسوپایەکی رەوانە کرد.

## شۆڕشی سامەرا

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە دەستەیەك لەخەڵکانی سامەرا کەنەزانرا کێن، شۆڕشیان کرد و دەرگای زیندانەکانیان شکاند و زیندانییەکانیان ئازاد کرد. دەستەیەك لەموالییەکان شوێنیان کەوتن بەلآم کۆمەلآنی خەڵك هێرشیان کردنەسەر و خوێنیان ڕشتن. لەم کاتەدا بوغا و ئوتامش و وەسیف و هەموان لەتورکەکان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکیان لێ کوشتن. لەناکاو بەردێك بەر وەسیف کەوت و فەرمانیدا ئەو شوێنەی ئەم بەردەی لێوە هاوێژراوە، بسوتێنن. مەغرببیەکان رووبەرووی تالآن کران بوونەوە. بەهەرحاڵ کۆتایی رۆژ ئاگری ئەم ئاژاوەیە دامرکایەوە.

## کوژرانی ئوتامش

لەم ساڵەدا ئوتامش و شوجاعی دەبیری کوژران.

چۆنیەتییەکەی بەو شێوە بوو: موستەعین دەستی دایکی و هەروەها ئوتامش و شاهەکی خزمەتکاری بۆ سەر گەنجینە ئاوەلآ کردو ئەنجامدانی هەرکارێکی لەلایەن ئەوانەوە بەرەوا دەزانی. زۆربەی ئەو سامانەی لەسەرزەمینەکانی دیکەوە دەهات، لەنێوان ئەم سێ کەسەدا دابەش دەکرا. ئوتامش زۆربەی سامانی گەنجینەی

هەڵدەگرت. ئەو ڕاهێنەر و ڕاوێژکاری عەباس منالی موستەعین بوو. پارەی ماوە لەم کەسە لەلایەن ئوتامشەوە هەڵدەگیرا و بۆ عەباسی پاشەکەوت دەکرد. موالییەکان سەیری ئەم سامانەیان دەکرد کەچۆن وەردەگیریت و لەلایەکی دیکە خۆیان لەچ بارودۆخێکدا ژیان بەسەر دەبەن. وەسیف و بوغا لەم کارە بەدوور بوون و لەبەر ئەمە موالییەکانیان دژی ئوتامش هان دەدا تا ئەوەی بڕیاریاندا و تورکەکان و فەرغانییەکان دژی ئوتامش شۆڕشیان کرد و خەڵکانی دوور و نزیك لەسەر سەری کۆبوونەوە و لەرەبیع الاخر/ مەی ئوردوویان لێدا و سوپایان بۆ لەناو بردنی ئەو ڕەوانە کرد. لەم کاتەدا ئوتامش لەگەڵ موستەعین لەکۆشك دانیشتبوو کەهەواڵەکەی پێگەیشت. ویستی هەڵبێت بەڵام نەیتوانی. داوای پەنای لەموستەعین کرد بەڵام ئەویش پەنای نەدا. خەڵك دوو ڕۆژ بەمشێوەیە مانەوە و دواتر هاتنە ناو کۆشك و ئوتامشیان گرت و خوێنیان ڕشت و شوجاعی دەبیریشان لەگەڵ ئەودا کوشت. ماڵەکانی ئوتامش تالان کرا و خەڵکان سامانێکی زۆریان دەستکەوت.

کاتێك ئوتامش کوژرا، موستەعین، باوکی ساڵح عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی یەزدادی وەك وەزیر دیاریکرد و فەزڵ کوڕی مەروانی لەدیوانی خەراج دوور خستەوە و عیسا کوڕی فەرخانشای لەجێگەی ئەو دانا. وەسیفی کردە فەرمانڕەوای ئەهواز و بوغای بچوکی کردە فەرمانڕەوای فەلەستین. دواتر بوغای بچوك ڕقی باوکی ساڵحی لەدڵ گرت و ئەو بۆ بەغداد هەڵات و موستەعین، محەممەد کوڕی فەزڵی جەرجەرائی لەجیاتی ئەو وەك وەزیری خۆی دیاریکرد و سەعید کوڕی حەمیدی وەك سەرپەرەستی دیوانی نامەکان دەستنیشان کرد. حەمدونی لەمبارەوە دەڵێت:

لبس السیف سعید بعد ما کان ذا طمرین لا نوبة له

ان لله لابات و ذا آیة لله فینا منزله

واتاکەی: سەعید دوای ئەوەی دوو دەست جلی کۆنی لەبەر دەکرد و نۆرەی نەبوو، شمشێری هەڵواسی. خواوەند نیشانەکانی هەیە و ئەمە نیشانەیەکە بۆ ئێمە نێردراوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی جوهم کوڕی بەدری شاعیر لەنزیك حەلەب کوژرا. ئەو لەبەغدادەوە بەرەو سنور دەڕۆشت کەسوارەکانی کەلب بینیان و خوێنیان ڕشت و سامانەکەیان ڕفاند. کاتێك بەرێگەدا دەڕۆشت، ئەم هۆنراوەی دەخوێندەوە:

ازید فی اللیل لیل ام سال فی الصبح سیل

ذکرت اهل دجیل این منی دجیل

واتاکەی: مەگەر شەو، شەوێکیان پێ زیاد کردووە کە لەبەرەبەیان لافاو بەرێکەوتووە. دانیشتوانی دوجەیلم بیر کەوتەوە، بەڵام من لەکوێ و دوجەیل لەکوێ؟

ماڵی ئەو لەگەڕەکی دوجەیل بوو.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی عەبدواحید لەدادیاری دوورخرایەوە و جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عوسمانی بەرجەمی جێگەی ئەوی گرتەوە. دەستەیەك ساڵی روودانی ئەم پێشهاتە بە٢٥٠/٨٦٤ زایینی دەزانن.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەردهەژێنێکی گەورە، شاری ڕەی لەراندەوە و ماڵەکانی وێران کرد و ژمارەیەك لەژێر دارویەردودا گیانیاندا. پاشماوەکان هەڵاتن و لەدەرەوەی شارەکە نیشتەجێ بوون. عەبدسەمەد کوڕی موسا کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ئیمام، کارگوزاری مەککە، ریّ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، سوپایەکی بەفەرماندەیی کوڕەکەی بۆ ئەلبە و قەڵاکانی سەرزەمینی فەرەنگ ڕەوانە کرد. سوپاکەی ئەو لەم کەنارانە کەوتە جموجۆڵ و تاڵانی کۆکردەوە و دەستیان بەسەر چەندین قەڵادا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی ئیبراهیم، ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەغلەب، پاشای ئەفریقییە، لەرۆژی سیانزەی زیقەعدە، بیست و نۆی دێسامبەر، مرد. کاتێك باوکی ئیبراهیم مرد، براکەی زیادە الله کوڕی محەممەد کوڕی ئەغلەب لەسەر تەختی ئەو دانیشت و پەیکی بەدوای خەفاجە کوڕی سوفیان، فەرمانڕەوای سیسیل نارد و ئەوی لەمەرگی براکەی ئاگادار کردەوە و دووبارە فەرمانڕەوایی ئەو سەرزەمینەی پێ بەخشی.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجای کۆچی( ٨٦٤ زایینی )

## بزوتنەوەی یەحیا کوڕی عومەری تالبی و کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی عومەر کوڕی یەحیا کوڕی حسەین کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکوفە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. دایکی ئەو فاتیمە کچی حسەین کوڕی عەبدوللە کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەبدوللە کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب بوو.

هۆکاری شۆڕشەکەی ئەمە بوو: باوکی حسەین بەرادەیەك هەژار و قەرزار بوو کەگیانی هاتە سەر لێو. ڕۆژێك ئەو عومەر کوڕی فەرەج، سەرپەرەستی کاروباری مناڵەکانی تالیبی کە لەخوراسانەوە هاتبووە لای موتەلیب و سەرپەرەستی کاروباری مناڵەکانی تالبی دەکرد، بینی و داوای لێکرد بڕێك پارەی بەقەرز پێ بدات، بەلاّم عومەر بەشێوەیەکی توند وەلاّمی دایەوە و زیندانی کرد تا ئەوەی کەسەکانی بوونە دەستەبەر و ئازادیان کرد. بەم شێوەیە لەزیندان هاتەدەر.

ئەو لەم کاتەدا رووی کردە بەغداد و شڵەژاو و پەرێشان لەو شارە مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ سامەرا. ئەو ڕۆشتە لای وەسیف تا مانگانەیەکی بۆ دیاری بکات بەلاّم وەسیف بەشێوەیەکی توند وەلاّمی دایەوە و وتی: بۆ دەبێت بەکەسێکی وەك تۆ مانگانە بدرێت؟ باوکی حسەین بۆ کوفە گەڕایەوە. لەم کاتەدا باوکی ئەیوب کوڕی حەسەن کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمانی هاشمی لەلایەن محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر، فەرمانڕەوایەتی کوفەی دەکرد. باوکی حسەین ژمارەیەکی زۆر لەعەرەبەکان و خەڵکانی کوفەی کۆکردەوە و رووی کردە فەلوجە. سەرپەرەستی بەرید ئەم هەواڵەی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە نووسی. محەممەد بەئەیوب و عەبدوللە کوڕی مەحمودی سەرەخسی جێگری ئەو لەسوادی عێراق فەرمانێکی نووسی و فەرمانی بەو دوانەدا بۆ جەنگ لەگەڵ یەحیا کوڕی عومەر کۆببنەوە. یەحیا کوڕی عومەر رووی کردە گەنجینەکانی کوفە تا بیت ئەلمال تالاّن بکات. وەك دەوترا دوو هەزار دینار (زێڕ) و حەفتا هەزار درهەم لەم گەنجینەدا پاشەکەوت کرابوو. یەحیا کوڕی عومەر پەردەی لەسەر کارەکەی خۆی لەکوفە

هەڵگرت و دەرگای زیندانەکانی کردەوە و زیندانییەکانی هێنایەدەر و کارگوزارەکانی لەکوفە دەرپەڕاند. لەم کاتەدا عەبدوللە کوڕی مەحمودی سەرەخسی لەگەڵ سوپاکەی خۆی رووبەرووی بوونەوە و یەحیا کوڕی عومەر روخساری سەرەخسی بریندار کرد و بەمشێوەیە عەبدوللە لەشکستدانی ئەو سەرکەوتوو نەبوو و سوپاکەی یەحیا سامان و چوارپێکانی ئەوانیان تالآن کرد.

یەحیا رووی کردە دەوروبەری کوفە و دەستەیەك لەزەیدییە شوێنی کەوتن و دەستەیەك لەدانیشتوانی ئەم کەنارانە تا دەرەوەی واست، بڕیارپیاندا هاوکاری بکەن. ئەو لەبوستان مایەوە وشوێنکەوتەکانی زیادیان کرد. محەممەد کوڕی عەبدوللە، حسەین کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی حسەین کوڕی موسعەبی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. سوپاکەی ئەو کەسانی پاڵەوان و بوێری زۆری تیا دەبینرا. حسەین بۆ جەنگی یەحیا بەرێکەوت و لەبەرابەر ئەو ریزی بەست بەلآم یەحیا خۆی لەجەنگ بەدوور گرت. یەحیا رێگەی کوفەی گرتەبەر و حسەین شوێنی کەوت تا ئەوەی یەحیا ڕۆشتە ناو کوفە. لەم کاتەدا عەبدولرەحمان کوڕی خەتاب ناسراو بەوجە ئەلفولس، پێش هاتنی یەحیا بۆ ناو کوفە رووبەرووی بوویەوە و عەبدولرەحمان لەم جەنگەدا شکستی خوارد و بەناچاری بۆ کەنارەکانی شاهی هەڵات. حسەین پەیوەستی بوو و هەردووك لەشاهی ئوردوویان لێدا.

زەیدییە پەیوەستی یەحیا کوڕی عومەر بوون. ئەو لەکوفە بانگەوازی رەزامەندی بنەماڵەی محەممەدی بەرز کردەوە. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و زاری خۆشەویستییان پێ دۆڕاند و هەمووان لەبەغدادییەکان ئەویان وەك سەرپەرەستی خۆیان دیاریکرد. هیچ کات رووی نەدابوو خەڵکانی بەغداد بەکەسێك جگە لەو رازی بن. لەکوفەیش دەستەیەك لەخەڵکە بیرمەند و ناسراوەکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد و دەستەیەك لەو کەسانی ئایینێکی دیاریکراویان نەبوو، پەیوەستیان بوون.

حسەین کوڕی ئیسماعیل لەشاهی مایەوە و وەچانی دەگرت و بەردەوام هێزە پشتیوانەکان لەدەوری کۆدەبوونەوە. یەحیا لەکوفە هێز و توێشوی کۆدەکردەوە و ژەنگی شمشێرەکانیان پاك دەکرد. دەستەیەك لەزەیدییە کەناشارەزای کاروباری جەنگ بوون داوایان لەیەحیا کرد جەنگ هەڵگیرسێنێت و لەسەر ئەم داوای خۆیان

پێداگرییان کرد. یەحیا لەشەوی دووشەممە سیانزەی ڕەجەب/ بیست و یەکی ئۆگۆست، لەگەڵ هەیسەمی عیجلی و کەسانی دیکە و پیادەکانی خەڵکی کوفە کە نەزانا بوون و نەبڕوادار، بەڕێکەوت. ڕێگەیان لەشەودا بڕی و بەرەبەیان لەئوردووگای حسەین نزیك کەوتنەوە. هێشتا تاریك بوو کەهێرشیان کردنەسەر. هاوەڵانی حسەین هەستان و بەرنگاریان بوونەوە. شمشێریان بەکار برد و شکستیان پێ هێنان. هەیسەمی عیجلی یەکەم کەس بوو ئەسیر کرا و پیادەکانی کوفە هەڵاتن. ئەسپەکان ئەوانیان لەژێر سمدا پێشێل کرد.

بەم شێوەیە سوپاکەی یەحیا کوڕی عومەر بڵاوەی لێکرد. ئەسپ، یەحیای خستە خوار کەزرێیەکی قورسی لەبەردا بوو و کوڕی خالید کوڕی عیمران لای سەری وەستا و بێ ئەوەی بیناسێت وتی: پیرۆزت بێت. چوونکە ئەو زرێیەی لەبەر یەحیا دابینی گومانی کرد لەسوپاکەی خوراسانە، فەرمانی بەکەسێکدا و سەری یەحیای بڕی. لەم کاتەدا یەکێك لەهاوەڵانی کوڕی خالید ئەوی ناسییەوە و وتی: ئەمە سەری یەحیایە و ئەویان بۆ لای محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر نارد. چەندین کەس کوشتنی ئەویان بەدەستی خۆیان دەزانی. محەممەد، سەری ئەوی بۆ بارەگای موستەعین نارد. سەری ئەو بۆ ماوەیەك لەسامەرا هەڵواسرا و دواتر دایان گرت و ڕەوانەی بەغدادیان کرد تا لەو شارەیش هەڵبواسرێت بەڵام محەممەد لەبەر زۆری خەڵکان کەکۆببوونەوە، نەیتوانی سەری یەحیا لەبەغداد هەڵواسێت. محەممەد ترسا سەری یەحیا ببەن و لەبەر ئەمە چاوپۆشی لەو کارە کرد و خستیە ناو قەفەسێك و لەشوێنی کەرەستەکانی جەنگ هەڵیگرت.

حسەین کوڕی ئیسماعیل سەری کوژراوەکانی لەگەڵ ئەسیرەکان بۆ بەغداد نارد و ئەسیرەکان لەو شارە زیندانی کران. محەممەد کوڕی عەبدوللە نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و خوازیاری بەخشینی ئەوان بوو. فەرمان درا زیندانییەکان ئازاد بکەن و سەرەکان بەخاك بسپێرن و لەهەڵواسینی ئەوان خۆیان بەدوور بگرن.

کاتێك هەواڵی کوژرانی یەحیا گەیشت، محەممەد کوڕی عەبدوللە بەزمێکی ڕازاندەوە و جەژنی گرت و پیرۆزباییان لەیەك کرد. داود کوڕی هەیسەم باوکی هاشمی جەعفەری هاتە لای و وتی: ئەی ئەمیر، بۆ کوشتنی خەڵك پیرۆزباییت لێ

دەکەن و ئەگەر پێغەمبەر (د.خ) زیندوو بوایە، دڵنەواییان دەکرد. محەممەد وەڵامی نەدایەوە. داود لەژێر لێو ئەم هۆنراوەی خوێندەوە و لەکۆشکەکەی هاتەدەر:

| | |
|---|---|
| یا بنی طاهر کلوه و بیئا | ان لحم النبی غیر مری |
| ان وترا یکون طالبه اللـ | ـه لوتر نجاحه بالحری |

واتاکەی: ئەی منداڵەکانی تاهیر! ئەو بخۆن چوونکە گۆشتەکەی نەخۆشیی پێوەیە، گۆشتی پێغەمبەر (د.خ) (یانی یەحیای زادەی پێغەمبەر (د.خ)) خۆش نییە. تۆڵەیەك کەخواوەند مافەکەی بستێنێت، تۆڵەیێکە بەختەوەرییەکەی رازاوەیە.

شاعیرەکان بەهۆی بڕوا و چاکەکاری یەحیا لەپرسەی ئەودا چەندین هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە کەیەکیان ئەمەیە:

| | |
|---|---|
| بکت الخیل شجوها بعد یحیی | و بکاه المهند المصقول |
| و بکته العراق شرقا و غربا | و بکاه الکتاب و التنزیل |
| و المصلی و البیت و الرکن و الحجـ | ـر جمیعا له علیه عویل |
| کیف لم تسقط السماء علینا | یوم قالوا: ابو الحسین قتیل |
| و بنات النبی یبدین شجوا | موجعات دموعهن همول |
| قطعت زجهه سیوف الاعادی | بابی وجهه الوسیم، الجمیل |
| ان یحیی ابقی بقلبی غلیلا | سوف یردی بالجسم ذاك الغلیل |
| قتله مذکر لقتل علی | و حسین یوم اوذی الرسول |
| صلوات الاله وقفا علیهم | ما بکی موجع و حنت ثکول |

واتاکەی: ئەسپەکان (سوارەکان) دوای یەحیا گریان بەهەمان شێوە کەشمشێری دروست کراو لەهندیش گریا. رۆژهەڵات و رۆژئاوای عێراق بۆی گریا، کتێب و تەنزیلیش بۆی گریا، نوێژگە و ماڵی خوا و روکن و حیجر بۆی گریان. چۆن ئاسمان بەسەرماندا نەکەوتەخوار ئەو رۆژەی وتیان: باوکی حسەین کوژرا. کچەکانی پێغەمبەر (د.خ) هەمووان خەمی خۆیان ئاشکرا کرد وهەمووان خەمبار و چاو بەگریانن. شمشێری دوژمنان روخساری ئەوی بڕی، باوکم بەقوربانی ئەو روخسارە جوانە بێت. یەحیا هەستێکی لەدڵمدا دروست کرد کەبەخێرایی هەست و گەرمی جەستەم لەناو دەبات. کوژرانی ئەو کوژرانی عەلی و حسەین بیر دێنێتەوە

کە پێغەمبەر (د.خ) رەنجا. سڵاوی خواوەند تا ئەو کاتە لەوان بێت کەدەردەدارێك بگریت و دڵ سوتاوێك بناڵێنێت.

## شۆڕشی حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەید کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی زەید کوڕی حەسەن کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب شۆڕشی کرد.

هۆکاری ئەم شۆڕشە ئەوە بوو کەموستەعین دوای سەرکەوتنی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر بەسەر یەحیا کوڕی عومەر، چەندین پارچەی لەزەوییەکانی خەلیفە لەتەبەرستان لەنزیك کەنارەکانی دەیلەم وەك دیاری پێبەخشی. ئەم زەوییە کەلار و شالوس بوو (کەلار دەشت و چالوسی ئێستا کە لەکۆنەوە بەم ناوە بووە و عەرەب لەبەر ئەوەی پیتی چ نییە دەیکات بەشین). لەبەردەم ئەم زەوییە، زەوییەك بوو کەخەڵکەکەی کەڵکیان لەدارەکانی وەردەگرت و چوارپێکانی خۆیان لەوێ دەلەوەڕاند و بەزەوی تایبەتی کەس دانەدەنرا. زەوییەکی مردوو بوو کەئاو و دار و گژ و گیای تیا دەبینرا. محەممەد، پێشکارەکەی خۆی جابر کوڕی هارونی نەسرانی (مەسیحی) بۆ گرتنی ئەم زەوییانە ڕەوانە کرد. فەرمانڕەوای تەبەرستان لەو کاتەدا سلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر، دانراو لەلایەن محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر بوو بەڵام محەممەد کوڕی ئەوسی بەڵخی کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد. محەممەد کوڕی ئەوس مناڵە گەنج و نەزانەکانی خۆی بۆ هەموو ناوچەکانی تەبەرستان ناردبوو و فەرمانڕەوایی سنورەکانی پێ سپاردبوون. خەڵك لەوان دڵگران و بەردەوام لەخراپەکاری ئەوان و باوکیان لای سلێمان سکاڵایان دەکرد.

محەممەد کوڕی ئەوس ڕۆشتە سەرزەمینی دەیلەم کەخەڵکەکەی لەگەڵ خەڵکانی تەبەرستان بەسازگاری ژیانیان بەسەر دەبرد، ژمارەیەکی لێ ئەسیر کردن و ژمارەیەکی کوشت. ئەم کردەوەی محەممەد لای خەڵکانی تەبەرستان نەشیاو بۆ رازی بوون بوو. کاتێك جابر کوڕی هارون بۆ وەرگرتنی زەوییەکانی محەممەد کوڕی عەبدوللە هات، دەستی بەسەر زەوییەکانی دراوسێی ئەو زەوییە گرت و

بڕیاریدا بەزۆر زەوتیان بکات. ئەوکەلار و چالوسی گرت.

لەو رۆژگارەدا دوو برا لەم سنورە دەژیان لەبەهادورەکان و لەکاتی هێرشی دەیلەمییەکان بەرگرییان لەتەبەرستان دەکرد. ئەم دوانە بەمیوانداری و چاکەکاری بەناوبانگ بوون. یەکیان محەممەد و ئەوی دیکەیان بەجەعفەر ناو دەبرا و هەردوك منالّی رۆستەم بوون. ئەم دوانە کردەوەی جابریان بۆ زەوت کردنی زەوییەکە پەسەند نەکرد. فەرمانەکانی ئەم دوانە لەو سنورە جێبەجێ دەکرا. بەمشێوەیە ئەوان داوایان لەفەرمانبەرانی خۆیان کرد رێگە نەدەن جابر دەست بەسەر ئەو زەوییانەدا بگرێت. جابر ترسا و هەلاّت و خۆی گەیاندە سلێمان کوڕی عەبدوللە. محەممەد و جەعفەر و هاوەلأنیان لەفەرمانڕەوای تەبەرستان ترسان و لەبەر ئەمە نامەیەکیان بۆ دراوسێکانی خۆی لەدەیلەم نووسی و پەیمانەکەی نێوانیان بیر خستنەوە و خۆیان لەگوناحەکەی محەممەد کوڕی ئەوس و کوشتارەکەی ئەو بەبێ تاوان زانی. هەمووان بۆ جەنگ لەگەلّ سلێمان کوڕی عەبدوللە و دەست و پێوەندەکانی یەکیان گرت.

لەم کاتەدا دوو کوڕەکەی رۆستەم و هاوەلأنی ئەوان پەیکیان بۆ لای یەکێك لەمنالّەکانی ئەبوتالیب (عەلەوییەکان) بەناوی محەممەد کوڕی ئیبراهیم لەتەبەرستان نارد تا بەیعەتی لەگەلّ ببەستن. پیاوی تالبی بەم پێشنیارە رازی نەبوو و وتی: من پیاوێك لەبنەمالّەکەی خۆم بەئێوە دەناسێنم کە بۆ ئەم کارە لەمن شیاوترە. حسەین کوڕی زەیدی لەڕەی بەوان ناساند. ئەوان کەسیان نارد و پەیغامەکەی محەممەد کوڕی ئیبراهیمیان گەیاند و داوایان لێکرد رێگەی تەبەرستان بگرێتەبەر. حەسەن کوڕی زەید رێگەی تەبەرستانی گرتەبەر و هەموو خەلّکانی دەیلەم و خەلّکی کەلار و چالوس و رویان، بەیعەتیان لەگەلّ بەست و بەکرگیراوانی کوڕی ئەوسیان دەرپەڕاند. ئەوان گەڕانەوە بۆ لای سلێمان کوڕی عەبدوللە. هەروەها دانیشتوانی کێوەکانی تەبەرستان وەك ئەسمەغان(مەسمەغان) قادوسیان، لەیس کوڕی قەتاد و دەستەیەك لەدەشتەکانی بن کێو، پەیوەستی بوون.

دواتر حەسەن و شوێنکەوتەکانی هێرشیان کردە سەر ئامول کەنزیکترین شار

لەوان بوو. کوڕی ئەوس لەشاری سارییەوە مەبەستی ئەوەی کرد دووری بخاتەوە. شەڕێکی قورس روویدا. حەسەن کوڕی زەید لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاکەی لەگۆڕەپانەوە بەرەو ئامول ئەسپی غاردا و ڕۆشتە ناو شارەکە.

کاتێك کوڕی ئەوس ئەم هەواڵەی بیست (هێشتا سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ سوپاکەی حەسەن بوو) چیتر جگە لەرزگار کردنی گیانی خۆی بیری لەهیچی دیکە نەدەکردەوە. کوڕی ئەوس هەڵات و لەساری پەیوەستی سلێمان بوو. کاتێك حەسەن دەستی بەسەر ئامولدا گرت، ژمارەی شوێنکەوتەکانی زیادی کرد و هەر تالانچییەکی شۆڕشگێر لەدەوری کۆبوویەوە. ئەو چەند رۆژێك لەئامول مایەوە و دواتر رێگەی ساری گرتەبەر تا شەڕ لەگەڵ سلێمان کوڕی عەبدوللە بکات. سلێمان رووبەرووی بوویەوە و لەدەرەوەی ساری، لەنێوان دوو سوپا شەڕ روویدا. دەستەیەك لەسەرکردەکانی حەسەن روویان کردە شارەکە و ڕۆشتنە ناوی. کاتێك سلێمان ئەمەی بیست، لەگەڵ هاوەڵانی بڵاوەی لێکرد و ژن و منداڵ و سامانەکەی لەساری پشتگوێ خست. حەسەن و هاوەڵانی دەستیان بەسەر ئەم سامانەدا گرت. ژن و منداڵەکانی سلێمانی سوار چوارپێ کرد و بۆ لای سلێمان لەگورگان ڕەوانەی کردن بەڵام سامانەکەی تالان کرا.

دەستەیەك وتوویانە شکستی سلێمان، دەست ئەنقەست بووە چوونکە هەموو تاهیرییەکان شوێنکەوتەی شیعییەکانن. کاتێك حەسەن کوڕی زەید هاتە تەبەرستان، سلێمان لەبەر ئەوەی شوێنکەوتەی شیعەکان بوو، جەنگ لەگەڵ ئەوی بەگوناح دەزانی و ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| نبئت خيل ابن يزويد اقبلت خببا | تريدنا لتحسينا الامرينا |
| يا قوم ان كانت الانباء صادقه | فالويل لى و الجميع الطاهريينا |
| اما انا فاذا اصطفت كتائبنا | اكون من بينهم رأس الموالينا |
| فالعذر عند رسول الله منبسط | اذا احتسبت دماء الفاطميينا |

واتاکەی: ئاگادار بوومەوە کەسوپای کوڕی زەید لەگەڵ ئەو ئەسپانەی بەوێرغە دێن، لەرێگەدان، ئەوان مەبەستی ئێمەیان کردووە تا خراپەی کارێکی گەورە بەئێمە بچێژن، ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئەم هەواڵانە راست بێت، کەواتە هاوار لەمن و هەموو

تاهیرییەکان. من ئەو کاتەی دەستەکانی سوپا ڕێك دەخرێت، لەناو ئەوان زیاتر لەهەمووان شوێنکەوتەی ئەو (کوڕی زەید) دەبم. کەواتە هەرکات ڕێز لەخوێنی فاتمییەکان بگرم، لای پێغەمبەر(د.خ) پاساوم دەبێت.

کاتێك دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، سلێمان شکستی خوارد و خەڵکانی تەبەرستان لەدەوری حەسەن کۆبوونەوە. ئەو سوپایەکی لەگەڵ یەکێك لەهاوەڵانی بەناوی حەسەن کوڕی زەید ڕەوانە کرد. ئەو شاری ڕەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و کارگوزاری تاهیرییەکانی لەو شارە دەرپەڕاند و پیاوێك لەعەلەوییەکانی وەك جێگری خۆی دانا بەناوی محەممەد کوڕی جەعفەر و دواتر ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.

موستەعین لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە. لەو کاتەدا وەسیف کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد. ئەحمەد کوڕی سالَح کوڕی شێرزاد دەبیری بوو. موستەعین، ئیسماعیل کوڕی فەراشەی لەگەڵ سوپایەك بۆ هەمەدان ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەوێ بمێنێتەوە تا ڕێگە لەهاتنە ناوەی سوپای حەسەن بگرێت و بەرگری کردن لەشارەکانی دیکەی بە محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر سپارد.

کاتێك محەممەد کوڕی جەعفەری عەلەوی، لەڕەی نیشتەجێ بوو، چەندین کاری ئەنجامدا کەبووە هۆی نارازی بوونی خەڵکی شارەکە. محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر، فەرماندەیەکی بۆ ئەو ناوچەیە ڕەوانە کرد بەناوی محەممەد کوڕی میکال. محەممەد کوڕی میکال سوپایەکی لەگەڵدا بوو. ئەو برای شاه کوڕی میکالە. محەممەد کوڕی میکال و محەممەد کوڕی جەعفەر لەدەرەوەی شاری ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و محەممەد کوڕی جەعفەر ئەسیر کرا و سوپاکەی شکستی خوارد و کوڕی میکال هاتە ناو شارەکە و نیشتەجێ بوو. حەسەن کوڕی زەید سوپایەکی بەفەرماندەیی واجن ڕەوانە کرد وکاتێك لەڕەی نزیك کەوتەوە، محەممەد کوڕی میکال ڕووبەڕووی بوویەوە. شەڕێکی قورس دەستپێکرد. کوڕی میکال شکستی خوارد و لەری سەنگەری گرت. واجن و سوپاکەی شوێنی کەوتن و گرتیان و خوێنیان ڕشت. شارەکە بۆ جارێکی دیکە کەوتە دەستی سوپاکەی حەسەن کوڕی زەید.

لەرۆژی عەرەفەی ئەم ساڵە، ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی حسەینی بچوك کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئیدریس کوڕی موسا کوڕی عەبدوللە کوڕی موسا کوڕی عەبدوللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەڕەی دەرکەوتن و ئەحمەد کوڕی عیسا نوێژی جەژنی قوربانی لەگەڵ خەڵکانی شارەکە خوێند. دواتر بانگەوازی رەزامەندی بنەماڵەی محەممەدیان بەرز کردەوە. محەممەد کوڕی عەلی کوڕی تاهیر جەنگی لەگەڵ کرد بەلآم محەممەد شکستی خوارد و بۆ قەزوین پاشەکشێی کرد.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا موستەعین، ڕقی جەعفەر کوڕی عەبدواحیدی لەدڵ گرت چوونکە وەسیف دەیوت جەعفەر نێردراوی ئەوانی بۆلای نۆکەرەکان (دەستەیەك لەهاورێیان و سوپاییەکان کەعەرەب بەشاکر ناویان دەبات) بەدبین کردووە. لەبەر ئەمە لەمانگی رەبیع الاوەل/ ئاوریل ئەویان بۆ بەسرە دوور خستەوە.

لەم ساڵەدا هەر پێگە و پلەیەك کەبۆ مناڵەکانی ئومەییە لەبەر چاو گیرابوو، هەڵوەشایەوە و کەسانێکی وەك باوکی شوارب و عوسمانییەکان کە لەدارئەلعامە خزمەتیان دەکرد، دوورخرانەوە و حەسەن کوڕی ئەفشین لەزیندان رزگاری بوو.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی فەزڵ کوڕی عیسا کوڕی موسا ناسراو بەبەشاشات، وەك کارگوزاری مەککە دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا خەڵکانی حیمس و دەستەیەك لەهۆزی کەلب دژی فەرمانڕەواکەی خۆیان، فەزڵ کوڕی قارن برای مازیار کوڕی قارن شۆڕشیان کرد و کوشتیان. موستەعین لەمانگی رەمەزان/ ئۆکتۆبەر موسا کوڕی بوغای بۆ حیمس نارد و ئەو لەنێوان حیمس و رەستەن رووبەروی خەڵکی شارەکە بوویەوە و شکستی پێهێنان و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و ژمارەیەکی لەدانیشتوانەکەی کوشت و شارەکەی سوتاند و دەستەیەك لەگەورەکانی ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی ئەحمەد کوڕی عەماری قازی و ئەحمەد کوڕی عەبدکەریمی حورانی تیمی، قازی بەسرە، مردن. لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی وەزیر

وەك قازی سامەرا هەڵبژێردرا.

لەم ساڵەدا نۆكەرەكان و سوپای فارس دژی عەبدوللە كوڕی ئیسحاق كوڕی موعتەسەم شۆڕشیان كرد و ماڵەكەیان تالآن كرد و محەممەد كوڕی حەسەن كوڕی قارنیان كوشت و عەبدوللە كوڕی ئیسحاق هەڵات.

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی عەبدوللە كوڕی تاهیر (لەخوراسان) دوو بت و چەندین فیلی پێشكەشی خەلیفە كرد كە لەكابولەوە بۆی هاتبوو. جەعفەر كوڕی فەزڵی بەشاشات، كارگوزاری مەككە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا زیادە الله كوڕی محەممەد كوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە مرد. ئەو یەك ساڵ و شەش ڕۆژ فەرمانڕەوا بوو. دوای ئەو برازاكەی محەممەد كوڕی باوكی ئیبراهیم ئەحمەد كوڕی محەممەد كوڕی ئەغلەب لەسەر تەخت دانیشت.

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی فەزڵی جەرجەرائی، وەزیری متوەكیل، و فەزڵ كوڕی مەروان، وەزیری موعتەسەم، مردن. فەزڵ كوڕی مەروان لەسامەرا مرد.

حسەین كوڕی زوحاكی شاعیر لەم ساڵەدا مرد. ساڵی لەدایك بوونی ئەو ٧٧٨/١٦٢ زایینییە. هۆنراوەكانی ئەو بەناوبانگە.

لەرەبیع الاوەلی ئەم ساڵە/ ئاوریل حارس كوڕی مسكین، قازی میسر كە لەمناڵەكانی ئەبوبەكری سەقەفییە و نەسر كوڕی عەلی كوڕی نەسر.كوڕی عەلی جەهزەمی، حافزی قورئان، مردن.

لەم ساڵەدا باوكی حاتەم سەهل كوڕی محەممەدی سەختیانی وشەناس كە لەباوكی زەید و ئەسمەعی و باوكی عوبەیدە حەدیسی دەگێڕایەوە، مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو پێش ٨٦٤/٢٥٠ زایینی دەزانن و خواوەند زاناترە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و یەکی کۆچی (٨٦٥ زایینی)

## چۆنیەتی کوژرانی باغەر تورك

لەم ساڵەدا باغەر تورك بەدەستی وەسیف و بوغا کوژرا.

هۆکاری کوشتنەکەی ئەمە بوو: باغەر یەکێك لەبکوژەکانی متوەکیل بوو. لەبەر ئەمە مانگانەکەی زیادی کرد و چەندین پارچەی زەوی پێ بەخشرا کەبەشێکی ئەم زەوییانە لەدەوروبەری کوفە بوو. ئەم زەوییانە بەیەکێك لەدانیشتوانی باروسما سپێردرا لەبری ساڵانەی دوو هەزار دینار. پیاوێك لەدانیشتوانی ئەم سنورە بەناوی کوڕی مارمە ناسازگاری لەگەڵ نوێنەری باغەر کرد. نوێنەری باغەر ئەوی گرت و قۆڵبەست کراو، ڕەوانەی زیندان کرا و دوای ئازاد بوون بەرەو سامەرا بەرێکەوت. کوڕی مارمە، ڕۆشتە لای دەلیل کوڕی یەعقوبی نەسرانی. دەلیل لەو ڕۆژەدا راوێژکاری بوغای شەرابی و بەرێوەبەری کارەکانی ئەو بوو. کوڕی مارمە هاورێی ئەو و باغەر خۆی یەکێك لەسەرکردەکانی بوغا بوو.

دەلیل، ڕێگەی نەدا باغەر ستەم لەکوڕی مارمە بکات و خوازیاری دادپەروەری بوو. باغەر، ڕقی دەلیلی لەدڵ گرت و ئەم دووانە خۆیان لەیەك بەدوور گرت.

باغەر بەرادەیەك بوێر بوو کەبوغا و کەسانی دیکە لێی دەترسان. لەیەکێك لەرۆژگاری زیحەججەی ساڵی ٢٥٠/ ٨٦٥ زایینی، باغەر مەست و سەرخۆش ڕۆشتە لای بوغا لەگەرما و پێی وت: ئایا هەرکەس دەلیل بکوژێت، تۆڵەی لێ دەکرێتەوە؟ دەیویست دەلیل بکوژێت. بوغا پێی وت: ئەگەر بتەوێت کوڕەکەم بکوژیت، ڕێگەت لێ ناگرم بەڵام پەلە مەکە چوونکە کاروباری خەلافەت لەدەستی دەلیلدایە. ڕێگە بدە کەسێکی دیکە لەجێگەی ئەو هەڵبژێرم ئەوسا ئەوە شمشێرەکەی تۆ و جەستەی ئەو.

بوغا پەیکی بەدوای دەلیلدا نارد و فەرمانی پێدا سوار ئەسپ نەبێت (واتە بۆ هیچ شوێنێك نەڕوات) و کەسێکی دیکەی بۆ کارەکانی دیوان راسپارد. باغەر گومانی دەکرد بوغا ئەوی لەسەر کار لابردووە و لەبەر ئەمە ئارامی گرت. دواتر بوغا ئەو دوانەی ئاشت کردەوە لەکاتێکدا هێشتا دەلیل لەباغەر دەترسا و باغەر

خزمەتکاری موستەعین بوو. موستەعینیان لەم ناسازگارییە ئاگادار کردەوە.

کاتێك سەرەی پاسەوانی کردنی باغەر لەکۆشکی موستەعین گەیشت، موستەعین پرسی: چ کارێکی بەئیتاخ سپاردبوو؟ وەسیف وەڵامی دایەوە. موستەعین وتی: شیاوە ئەم کارانە بەباغەر بسپێریت. دەلیل ئەم قسەی بیست و سوار لەسەر ئەسپ رۆشتە ماڵی بوغا و وتی: پێگە و پلەی باغەر زیاد کرا، تۆ لەماڵەوە دانیشتوویت و ئەوان خوازیاری لەسەر کار لابردنی تۆن و ئەو کاتەی دوورخرایتەوە، دەتکوژن.

بوغا هەمان رۆژ خۆی گەیاندە کۆشکی خەلیفە و بەوەسیفی وت: دەخوازیت من لەسەر کار لاببەیت؟ وەسیف سوێندی خوارد لەمەبەستی خەلیفە ئاگادار نییە. ئەم دوانە پەیمانیان بەست باغەر لەکۆشك دەربکەن و رێگە چارەیەك بدۆزنەوە. لەبەر ئەمە ئەم قسەیان بڵاو کردەوە کەخەلیفە ئەو دەکاتە جێگری وەسیف و بوغا و خەڵاتی پێ دەبەخشێت. باغەر و شوێنکەوتەکانی هەستیان بەمەترسی کرد و لەمەبەستی ئەو دوانە ئاگادار بوونەوە. لەبەر ئەمە ئەو دەستەی لەکوشتنی متوەکیل پەیمانیان لەگەڵ بەستبوو لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەدەوری کۆبوونەوە و دووبارە پەیمانیان بەست موستەعین و بوغا و وەسیف بکوژن. باغەر پێی وتن: دوای کوشتنی موستەعین بەیعەت لەگەڵ منداڵی موعتەسەم یا واسق دەبەستین و دوای ئەوە بارودۆخمان سەقامگیر دەبێت هاوشێوەی بوغا و وەسیف. شوێنکەوتەکانی بەم وتەیە رازی بوون.

موستەعین لەم گفتوگۆیە ئاگادار بوویەوە. ئەو کەسی بەدوای بوغا و وەسیف نارد و پێی وتن: ئێوە فەرمانڕەواییتان بەمن بەخشی و هەنووکە خوازیاری کوشتنی منن؟ ئەو دوانە سوێندیان خوارد ئاگاداری ئەم پیلانە نین. موستەعین ئەوانی ئاگادار کردەوە و بڕیاریاندا باغەر و دوو تورکەکەی هاورێی بگرن و زیندانیان بکەن. باغەر لەگەڵ دەستەیەك هات، ئەویان بۆ گەرماو برد و لەهەمان گەرماو زیندانییان کرد.

تورکەکان لەگرتنی باغەر ئاگادار بوونەوە و هێرشیان کردە سەر ئاخوڕی خەلیفە و تالانییان کرد و سوار ئەسپەکانی خەلیفە بوون و گەمارۆیان خستە سەر

کۆشك. موستەعین فەرمانی کوشتنی باغەری بەوەسیف و بوغادا و بەمشێوەیە خوێنی باغەریان ڕشت.

## ڕۆشتنی موستەعین بۆ بەغداد

کاتێك باغەر کوژرا و هەواڵەکەی بەگوێی تورکە ئاژاوەچییەکان گەیشت، درێژەیان بەئاژاوەگێڕیدا. موستەعین و بوغا و وەسیف و شاهەکی خزمەتکار و ئەحمەد کوڕی ساڵح کوڕی شێرزاد و دەلیل هاتنە بەغداد. دستەیەك لەفەرماندەکانی تورك ڕۆشتنە لای ئاژاوەچییەکان و داوایان لێکردن بکشێنەوە بەلاَم ئەوان ڕازی نەبوون و کاتێك لەهاتنی موستەعین و بوغا و وەسیف ئاگادار بوونەوە، پەشیمان بوونەوە و مەبەستی ماڵی دەلیل و بنەماڵەکە و دراوسێکانی ئەویان کرد و هەموویان بەتالاَن برد تا ئەو جێگەی چاویان لەکۆڵەکەی سەقفی خانووەکان و ئاڵیکیش نەپۆشی. دواتر ڕێگەی بەغدادیان گرتەبەر و لەم کاتەدا کوڕی مارمە نەخۆش کەوت. دەلیل ڕۆشتە سەردانی و پێی وت: بۆ نەخۆش کەوتوویت؟ وتی: شوێنی برینی زنجیر دەمی کردۆتەوە. دەلیل وتی: ئەگەر شوێنی برینی زنجیر دەمی کردەوە، پەیمانی خەلافەتت شکاند و شۆڕشت کرد. کوڕی مارمە لەم ڕۆژانەدا مرد و یەکێك لەشاعیرەکان لەبارەی ئەو وتی:

| | |
|---|---|
| لعمری لئن قتلوا باغرا | لقد هاج باغر حربا طحونا |
| وفر الخليفة و القائدا | ن بالليل يلتمسون السفينا |
| و صاحوا بمنشار ملاحهم | فجاءهم يسبق الناظرينا |
| فألزمهم بطن حراقة | و صوت مجاذيفهم سائرينا |
| و ما كان قدر ان مارمة | فنكسب فيه الحروب الزبونا |
| و لكن دليل سعى سعية | فأخزى الاله بها العالمينا |
| فحل ببغداد قبل الشروق | فحل بها منه ما يكرهونا |
| فليت السفينه لم تأتنا | و فرقها الله و الراكبينا |
| و اقبلت الترك و المغربون | و جاء الفراغنة الدارعونا |
| تسير كراديسهم فى السلاح | يرجون خيلا و رجلا بنينا |

| | |
|---|---|
| فقام بحربهم عالم | بأمر الحروب تولاه حينا |
| فجدد شورا على الجانبيـ | ن حتى احاطهم اجمعينا |
| و احكم ابوابها المصمتات | على السور يحمى بها المستعينا |
| و هيا مجانيق خطارة | تفيت النفوس و تحمى العرينا |

واتاكەی: سوێند بەگیانی خۆم ئەگەر باغەریان کوشت، ئەو ئاژاوە شەڕێکی ماڵوێرانکەری خۆش کرد. خەلیفە و دوو سەرکردە لەکاتی شەودا هەڵاتن و بەدوای کەشتیدا دەگەڕان. لەمیسان خزمەتکارەکەی خۆیان بانگ کرد کەهات و لەبینەران پێش دەکەوت. ئەو ئەوانی لەناو پاپۆڕێك جێگە کردەوە و سەوڵەکانیان کەوتە دەنگ. مەگەر کوڕی مارمە چ پێگەیەکی هەبوو کە بۆ ئەو گرفتاری شەڕێکی قورس ببین. بەڵام دەلیل هەوڵی خۆیدا و خواوەند بەهۆی ئەو جیهانیانی ریسوا کرد. پێش هەڵاتنی هەتاو گەیشتە بەغداد و بەهۆی ئەو لەبەغداد چەندین پێشهاتی ناخۆش روویاندا. خۆزگە کەشتی نەدەهاتە لای ئێمە و خواوەند لەگەڵ نەفەرەکانی نغرۆی دەکرد. تورك و مەغربییەکان هاتن و فەرغانییە زرێدارەکان ئوردوویان لێدا. دەستە جەنگییەکانیان بەکەرەستەی جەنگەوە رێگەیان دەبڕی. سوار و پیادەی کیسە لەشان دەهاتن. و کەسێکی زانا لەکاروباری جەنگ کەهەندێ کات فەرماندەیی دەگرتەدەست، رووبەڕوویان بوویەوە. دیوارێکی تازەی دروست کرد و لەهەردوو لا، بەشێوەیەك هەمووانی گرتەوە. دەرگا داخراوەکانی دیوارەکەی قایم کرد تا بەهۆیەوە پشتیوانی لەموستەعین بکات. کەشکەنجیرە گەورە و زیان گەیێنەرەکانی ئامادە کرد تا مەرئك بئافرێنێت و شارەکە بپارێزێت.

خەڵکان، رێگەیان لەهاتنە ناوەی تورکەکان گرت و ئەو کەشتیوانەی کەشتییەکەی خۆی بەکرێ دابوو بەوان، گرتیان و کوشتیان و لەسەر کەشتییەکەی هەڵیانواسی. (تا خاوەن کەشتییەکان وانە وەربگرن وکەشتی خۆیان بەکرێ نەدەن بەتورکەکان) کەشتیوانەکان تەنیا بەشێوەیەکی نهێنی و دوور لەچاو دەڕۆشتن.

موستەعین لەبیست و پێنجی موحەرەم/ بیست و حەوت فەوریەی ئەم ساڵە گەیشتە بەغداد و ڕۆشتە ناو کۆشکی محەممەد کوڕی عەبدوڵلە کوڕی تاهیر. دواتر سەرکردەکان گەیشتنە بەغداد جگە لەجەعفەر کوڕی خەیات و سلێمان کوڕی

بەحیا. زۆربەی لێپرسراوان و کارگوزارەکان و منداڵەکانی هاشم و دەستەیەك لەهاوەڵانی بوغا و وەسیف مەبەستی هاتن بۆ بەغدادیان کرد.

## چۆنیەتی بەیعەت لەگەڵ موعتەز باللە

خەڵك لەم ساڵەدا بەیعەتیان لەگەڵ موعتەز باللە کرد.

چۆنیەتی ئەم بەیعەتە بەمشێوەیە: کاتێك موستەعین لەبەغداد جێگیر بوو، دەستەیەك لەسەرکردەکانی ئاژاوەگێری تورك هاتنە لای و ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی و گیانی خۆیان خستە بەردەست و لەبەر ریسوایی شمشێرەکانی خۆیان بەملیانەوە هەڵواسی و داوای بەخشینیان لەموستەعین کرد. موستەعین پێی وتن: ئێوە خەڵکانێکی سەرکێش و ئاژاوەگێرن کەرێز لەنیعمەتەکان ناگرن. مەگەر سەبارەت بەمناڵەکانتان نامەتان بۆ من نەنووسی و ئەوانم پەیوەستی ئێوە نەکرد کەزیاتر لەدوو هەزار مناڵ بوون، سەبارەت بەکچەکانتان کەژمارەیان چوار هەزار کەس بوو، فەرمانم دەرکرد ئەوان بخەنە ریزی ئەوانەی هاوسەریان کردووە. وەڵامی هەموو داواکارییەکانی ئێوەم دایەوە و مانگانەی ئێوەم زیاد کرد و بەناچاری بۆ ڕەزامەندی ئێوە دەفرە سیمین و زیوینەکانم کردە سکە و خۆم لەخۆشییەکان بەدوور گرت بەڵام دووبارە سەرکێشی و نافەرمانیتان زیادی کرد. ئەوان دەستیان بەگریان کرد و داوای بەخشینی موستەعینیان کرد. موستەعین وتی: ئێوەم بەخشی و لێتان ڕازیم.

یەکێك لەوان بەناوی بابی بەك بەموستەعینی وت: ئێستا کە لەئێمە خۆش بوویت، هەستە و سوار ئەسپەکەت لەگەڵمان وەرە بۆ سامەرا چوونکە تورکەکان چاوەڕوانی هاتنی تۆن. محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر ئەم قسەی بیست و فەرمانی بەیەکێك لەپیاوەکانیدا لەو پیاوە بدات. ئەو لەبابی بەکیدا. محەممەد وتی: لەگەڵ سەروەری باوەڕداران بەم شێوەیە قسە دەکەیت: (هەستە و سوار ئەسپەکەی خۆت لەگەڵمان وەرە بۆ سامەرا) موستەعین پێکەنی و وتی: ئەوان عەرەب نین و سنووری قسە کردن نازانن. دواتر وتی: ئێوە بگەڕێنەوە بۆ سامەرا، مانگانەکانتان بەدەست دەکات، منیش ئەندێشە لەکارەکانی خۆم دەکەم.

تورکەکان هیوابڕاو لای موستەعین گەڕانەوە و لەکردەوەی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر لەگەڵ بابی بەك توڕە بوون. ئەوان گەیشتنە لای هەرکام لەتورکەکان، بەسەرهاتی خۆیان گێڕایەوە و چەندین قسەی دیکەیان بەرووداوەکە زیاد کرد و قسەکانی موستەعینیان هەڵگەڕاندەوە بۆ ئەوەی بۆ لەسەر کارلابردنی موستەعین هانی بدەن. هەموویان بڕیاریاندا موعتەز لەزیندان بێننەدەر. ئەو و مۆئەییەد هەردووك لەناو کۆشکدا زیندانی کرابوون و چەندین کەس ئەرکی پاسەوانی کردنی ئەوانیان لەئەستۆدا بوو. موعتەزیان لەزیندان هینایەدەر، مووی سەریان کورت کردەوە و وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ بەست. موعتەز فەرمانیدا بەپیرۆزی ئەم بەیعەتە مانگانەی دە مانگ بەهەموان بدەن بەڵام دارایی ئەو بەسەندەی نەکرد و بەهۆی کەمی دارای، تەنیا مانگانەی دوو مانگیان پێدان.

موستەعین لەگەنجخانەی سامەرا نزیکەی پێنسەد هەزار دیناری دانابوو، لەگەنجینەی دایکی موستەعین نزیکەی هەزار هەزار دینار و لەگەنجینەی عەباس (کوڕی موستەعین) شەشسەد هەزار دینار دەبینرا.

لەناو ئەو کەسانەی بۆ بەستنی بەیعەت هاتن، یەکیان باوکی ئەحمەد کوڕی ڕەشید بوو. ئەو نەخۆش و بەناچاری لەسەر تەخت ئەویان هێنا. فەرمانیان پێدا بەیعەت ببەستێت بەڵام ڕازی نەبوو وبەموعتەزی وت: هاوشێوەی کەسێکی فەرمانبردار هاتیتە لای ئێمە و دەستت لەخەلافەت هەڵگرت و وتت هیچ کات کاروباری خەلافەت ناگریتە دەست. موعتەز وتی: منیان بۆ ئەو کارە ناچار کرد و لەشمشێر ترسام. باوکی ئەحمەد وتی: ئێمە لەناچار کرانی تۆ ئاگادار نەبووین و بەیعەتمان لەگەڵ ئەو پیاوە (موستەعین)بەست. دەتەوێت ژنەکانمان بەرەڵا بن و سامانمان بەفیڕۆ بڕوات؟ (سوێندی تەڵاقیان خواردبوو) کەس نازانێت چی ڕوودەدات. ئەگەر هەموو خەڵك بۆ خەلافەتی تۆ هاوهەڵوێست بن، منیش یەکێك دەبم لەوان و گەرنە ئەوە من و ئەوە شمشێر. موعتەز چاوی لێ پۆشی (یانی چی دەبێت من پشتگوێ بخەیت تا ئەو کاتەی خەڵکان لەسەر خەلافەتی تۆ ڕێکدەکەون و لەو کاتەیشدا منیش بەیعەت دەبەستم و گەرنە هیچ کات چاوەڕوان مەبە لەبەر چاوی خەڵکان بەیعەت لەگەڵ تۆ ببەستم)

لەناو ئەو کەسانەی بەیعەتیان بەست، ئیبراهیمی دیرەج و عیتاب کوڕی عیتاب دەبینران. بەڵام عیتاب هەڵات و لەبەغداد پەیوەستی موستەعین بوو. بەڵام دیرەج مایەوە و وەك فەرماندەی پاسەوانەکان و سەرپەرەستی دیوان و گەنجینەکان هەڵبژێردرا.

کاتێك هەواڵی بەیعەت لەگەڵ موعتەز و دانانی کارگوزارەکان بە محەممەد کوڕی عەبدوللە گەیشت، فەرمانیدا ڕێگە نەدەن خواردەمەنی بەخەڵکانی سامەرا بگات. نامەی بۆ مالك کوڕی تەوق نووسی تا خۆی و بنەماڵە و سوپاکەی بەرەو بەغداد بەرێکەون. هەروەها نامەی بۆ نەجوبە کوڕی قەیس کارگوزاری ئەنبار نووسی هێز کۆبکاتەوە و فەرمانی بەسلێمان کوڕی عیمرانی موسڵیدا ڕێگە نەدات کەشتییەکانی هەڵگری خواردەمەنی بگاتە سامەرا. ئەو دەستی بەسەر کەشتییەکدا گرت کەبرنج و خواردنی دیکەی هەڵگرتبوو. کەشتیوانەکەی هەڵات. کەشتییەکە مایەوە تا ئەوەی لەئاودا نغرۆ بوو.

موستەعین، فەرمانی بە محەممەد کوڕی عەبدوللەدا، چواردەوری بەغداد بگرێت. ئەویش فەرمانی کار کردنی دەرکرد و بەدەروی بەغداد لەدیجلەوە تا دەرگای شەماسییە و لەوێوە تا سێ شەممە بازار دیواری کێشا و پەیوەستی دیجلەی کرد و فەرمانیدا لەهەردوولا خەندەك هەڵکەنن و بۆ هەردەروازەیەك فەرماندەیەکی دانا. خەرجی ئەمکارە سێسەد و سی هەزار دینار خەمڵێنرا. ئەو لەسەر هەر دەروازەیەك کەشکەنجیر ودیوارکوتەکانی دانا و بورجەکانی لەسوپاییەکان ئاخنی.

محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی بۆ فێڵباز و سەرسەرییەکان ڕۆژانەی دیاریکرد و کەسێکی بەناوی یەنبوبە وەك فەرماندەیی ئەوان دانا. قەڵغانی لەبۆریای قیراوی بۆ دروست کردن و کیسەکانی بۆ پڕ کردن لەبەرد و بەرد هاوێژ (قۆچەقانی) دایە دەستیان. هەروەها داوای هاوکارییان لەدەستەیەك حاجی خوراسانی کرد و ئەوانیش رازی بوون.

موستەعین فەرمانی بۆ لێپرسراوانی کۆکردنەوەی باجی هەر دیارێك نووسی تا خەراج و سامان بۆ بەغداد ڕەوانە بکەن و هیچ بۆ سامەرا نەنێرن. نامەیەکی بۆ تورکەکان وسوپاییەکانی سامەرا نووسی و داوای لێکردن بەیعەتەکەی خۆیان

لەگەڵ موعتەز بشکێنن و رێز لەپەیمانەکەیان لەگەڵ ئەو (موستەعین) بگرن. باسی چاکییەکانی خۆی کرد و لەپەیمان شکێنی و خراپەکاری دووری خستنەوە.

لەنێوان موعتەز و محەممەد کوڕی عەبدوللە چەندین نامە ئاڵ و گۆڕ کرا. موعتەز داوای لە محەممەد دەکرد بەیعەتی لەگەڵ ببەستێت و بیری دەکردەوە کەمتوەکیل دوای مونتەسیر بەیعەتی بۆ ئەو وەرگرتبوو. محەممەدیش لەبەرابەردا داوای دەکرد ملکەچی فەرمانەکانی موستەعین بێت. هەرکام بەڵگە و پاساوی بۆ ئەوی دیکە دەهێنایەوە.

محەممەد کوڕی عەبدوللە فەرمانیدا پردەکان بشکێنن و ئاو لەناو گەڕەك و کۆڵانەکانی ئەنبار و بادوریا ڕەوان بکەن تا دەستی تورکەکان لەئەنبار کورت بکاتەوە. موستەعین و موعتەز هەرکام بەشێوەیەکی جیا نامەیان بۆ موسا بوغا نووسی و پێشنیاری پەیوەست بوونیان پێکرد. موسا لەدەوروبەری شام دەژیا و بۆ جەنگ لەگەڵ خەڵکانی حیمس ڕۆشتبوو. ئەو شوێن موعتەز کەوت و مەبەستی هاوکاری کردنی ئەوی کرد. لەولا عەبدوللە کوڕی بوغای بچوك لەسامەراوە هاتە لای موستەعین. موستەعین ئەوی وەك جێگری باوکی دەستنیشان کردبوو بەڵام عەبدوللە کوڕی بوغا رازی نەبوو و بەباوکی خۆی وت: هاتووم تا لای تۆ گیان بسپێرم. ئەو چەند رۆژ لەبەغداد مایەوە و دواتر بۆ سامەرا هەڵات و داوای بەخشینی لەموعتەز کرد و وای نیشاندا ڕۆشتۆتە بەغداد بۆ ئەوەی هەواڵ و زانیارییەکان بەدەست بێنێت و بگەڕێتەوە. موعتەز ئەوی بەخشی و کارەکانی بۆ گەڕاندەوە. حەسەن کوڕی ئەفشین هاتە بەغداد و موستەعین، رێزی لێگرت و دەستەیەك لەئەشروسنە و کەسانی دیکەی پەیوەستی سوپاکەی ئەو کرد.

## گەمارۆدرانی موستەعین لەبەغداد

موعتەز لەبیست و سێ موحەرەم/ بیست و پێنجی فەوریە بۆ براکەی باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل یا هەمان موەفەق ئاڵای جەنگ لەگەڵ موستەعین و محەممەد کوڕی عەبدوللەی بەست و ئەوی بۆ ئەم کارە راسپارد. سوپایەکی خستە ژێر فەرمان و فەرماندەیی هەموو کارەکانی خستە ئەستۆ و بەرێوەبردنی

کاروبارەکانی بەکەلباتکین سپارد. موەفەق لەگەڵ پەنجا هەزار سەرباز لەتورکەکان و فەرغانییەکان لەگەڵ دوو هەزار مەغربی بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە عوکبرا، نوێژی جەماعەتی خوێند (خۆی پێشنوێژ بوو) وتاری خوێندەوە و وەك خەلیفە لەوتارەکەیدا ئاماژەی بەناوی موعتەزدا و هەموو هەواڵەکانی بۆ موعتەز نووسی. دەستەیەك لەخەڵکانی عوکبرا دەیانوت لەهاتنی محەممەد کوڕی عەبدوللە بۆ رووبەروو و جەنگی ئەوان دەترسن. بەپێی ئەوەی ئەوان دەیانوت سوپاییەکانی محەممەد کوڕی عەبدوللە گوندەکانی نێوان عوکبرا و بەغدادیان تالاًن کردووە و زەوییە کشتوکاڵییەکانیان لەناو بردووە و ئەوەی بینیویانە، ئەسیریان کردووە.

کاتێك موەفەق گەیشتە عوکبرا، ژمارەیەك لەشوێنکەوتەکانی بوغای بچوك (لەسەرکردەکانی محەممەد کوڕی عەبدوللە) پەیوەستی موەفەق بوون. موەفەق و سوپاکەی ئەو لەحەوتی سەفەر/ یانزەی مارس گەیشتنە دەروازەی شەماسییە. یەکێك لەخەڵکانی بەسرە بەناوی بازنجانە ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

یا بنی طاهر اتتکم جنود الـ      لله و الموت بینها منثور

و جیوش امامهم ابو احـــ      مد نعم المولی و نعم النصیر

واتاکەی: ئەی منداڵەکانی تاهیر! سوپاییەکانی خواوەند هاتوون و باهاتنی ئەوان مەرگ بلاًو بۆتەوە، ئەو سوپاییانەی پێشەواکەیان باوکی ئەحمەدە کەسەرپەرەستێکی چاك و باشترین یاوەر و پشتیوانە.

کاتێك موەفەق لەدەروازەی سەماسییە ئوردووی لێدا، موستەعین فەرماندەیی بەرگری کردن لەم دەروازەی بەحسەین کوڕی ئیسماعیل سپارد و هەموو سەرکردەکانی خستە ژێر فەرمانی ئەو. ئەو تا کۆتایی جەنگەکە لەوێ مایەوە و دواتر رێگەی ئەنباری گرتەبەر. لەدەی سەفەر/ چواردەی مارس، پێشەنگەکانی تورك گەیشتنە دەروازەی شەماسییە و لەنزیك دەروازەکە چاوەڕێ مان. محەممەد کوڕی عەبدوللە، حسەین کوڕی ئیسماعیل و شا کوڕی میکال و بونداری تەبەری بۆ جەنگی تورکەکان ڕەوانە کرد و خۆی مەبەستی گۆڕەپانی جەنگی کرد کەشا هاتە لای و ئاگاداری کردەوە: تورکەکان کاتێك ئالاًکانی سوپاکەی ئێمەیان بینی، بۆ ئوردوگاکەی خۆیان گەڕانەوە و بەمشێوەیە محەممەد لەمەبەستەکەی پەشیمان

بوویەوە.

بۆ بەیانی محەممەد بڕیاریدا سوپاکەی بۆ قوفس ڕەوانە بکات تا لەوێ بەناویاندا بگەڕێت و بەمشێوەیە ترس لای تورکەکان دروست بکات. ئەو کەزرێی لەبەردا بوو، سوار ئەسپەکەی بوو. وەسیف و بوغا و فەقیە و قازییەکان هاورێیەتیان دەکرد. پەیکی بۆ لای تورکەکان نارد تا لەم سەرکێشییە پەشیمان ببنەوە. و لەبەرابەر ئەوەی کەموعتەز جێگری موستەعین بێت ئەمانی پێ بەخشین بەڵام تورکەکان رازی نەبوون.

محەممەد بەهاورێیەتی وەسیف و بوغا لەکەنار دیجلە ئوردوویان لێدا بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی خەڵکان زیادی کردبوو، توانای پێشڕەوی نەما و گەڕایەوە.

بۆ رۆژی دواتر، چەندین پەیەك لەلایەن وەجە فولس وسەرکردەکانی دیکە هاتنە لای محەممەد و ئەویان لەنزیك بوونەوەی تورکەکان ئاگادار کردەوە. ئەوان وتیان تورکەکان لەڕوقەی شەماسییە خێوەتیان هەڵداوە. محەممەد پەیامی بۆ ناردن: جەنگ دەست پێمەکەن و ئەگەر ئەوان جەنگیان دەست پێکرد، ئەمرۆ بەهەر جۆرێك بووە ببەنە سەر. دوانزە سوار لەتورکەکان لەدەروازەی شەماسییە نزیك بوونەوە و تیریان هاویشت بەڵام کەس رووبەروویان نەبوویەوە بەڵام لەبەر ئەوەی لەسەر کارەکەیان بەردەوام بوون، سەربازێك بەردی بۆ هاویشتن کەیەکیانی کوشت و هاورێکانی جەنازەی ئەویان هەڵگرت و گەڕانەوە.

عوبەیدالله کوڕی سلێمان راوێژکاری وەسیفی تورك لەگەڵ سێسەد پیاو گەیشت و محەممەد کوڕی عەبدوللە، خەڵاتی کرد. تورکەکان لەم رۆژەدا روویان کردە دەروازەی شەماسییە و حەسەن کوڕی ئیسماعیل لەگەڵ سەرکردەکانی هاورێی بۆ جەنگی ئەوان هاتەدەر و رووبەرووی یەکبوونەوە. لەهەر دوو سوپا ژمارەیەك کوژران و دەستەیەك بریندار بوون. کوژرا و برینداری هەردوو سوپا یەك ئەندازە بوون. دانیشتوانی بەغداد هەڵاتن بەڵام بوریادارەکان خۆڕاگرییان کرد (بوریاداران: داینشتوانی بەغداد بوون کەقەڵغانەکەیان لەبوریای قیراوی بوو، بوێری ئەوان لەجەنگی تاهیر و گرتنی بەغداد بەناوبانگە) هەموان ڕۆشتن. لەم کاتەدا تورکەکان قەڵاکوتێکیان هێنا بەڵام بوریاداران بەسەریاندا سەرکەوتن و قەڵاکوتەکەیان لێ

سەندن. دواتر دەستەیەك لەتورکەکان ڕێگەی نەهرەوانیان گرتەبەر. محەممەد کوڕی عەبدوللە دوو فەرماندە لەهاوەڵانی خۆی لەگەڵ دەستەیەك ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان لەو ناوچەیە بمێننەوە و ڕێگە مەدەن تورکەکان دەستی بەسەردا بگرن. تورکەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد و سوپاکەی محەممەد هەڵاتوو، گەڕایەوە بۆ ناو بەغداد. تورکەکان سەر بڕاوەکانیان بۆ سامەڕا نارد و دەستیان بەسەر ڕێگەی خوراساندا گرت و ڕێگەی بەغدادیان بەست.

موعتەز سوپایەکی نارد. ئەم سوپایە لەڕۆژئاواوە ڕێگەی بەغدادیان گرتەبەر و لەقوتەربول گوزەریان کرد. ئەمە ڕوودداوە لەدوانزەی مانگی سەفەر/ چواردەی مارس ڕوویدا. بۆ بەیانی، محەممەد کوڕی عەبدوللە سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد و شا میکال ڕووبەڕوویان بوویەوە و جەنگ دەستی پێکرد. سوپاکەی موعتەز شکستی خوارد. محەممەد کوڕی عەبدوللە بۆ تورکەکان بۆسەی دانابوو و لەبەر ئەوەی ئەوان بەشێوەیەکی نهێنی لەحەشارگەکانی خۆیان هاتنەدەر، سوپاکەی سامەڕا شکستی خوارد و سوپاکەی محەممەد، هێرشیان کردنەسەر و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و تەنیا دەستەیەکی کەم ڕزگاریان بوو. ئوردووی ئەوان تالان کرا و ئەوەی ڕزگاری بوو، لەڕووباری دیجلەیدا تا خۆی بەئوردووگای موەفەق بگەیێنێت بەڵام ئەوانیش لەلایەن کەشتییەکانەوە ئەسیر کران. ئەوان ئەسیر وسەرە بڕاوەکانیان بەکەشتی بۆ بەغداد برد. ژمارەیەك سەریان لەبەغداد هەڵواسی.

محەممەد کوڕی عەبدوللە فەرمانیدا هەرکەس لەو ڕۆژەدا بوێری و ئازایەتی لەخۆی نیشان داوە، دەستبەندی زێڕین و پاداش و سامانێکی بەرچاوی پێ ببەخشن. هەروەها فەرمانیدا شوێن هەڵاتووان بکەون. دەستەیەك لەهەڵاتوان گەیشتنە ئەوانا و دەستەیەکیان گەیشتنە سامەڕا. ئوردووی موعتەز چوار هەزار کەس بوو، دوو هەزاریان کوژرا و ژمارەیەکیان لەئاودا خنکان و ژمارەیەکیان ئەسیر کران. محەممەد بەهەموو سەرکردەکانی سوپا چوار خەڵات و بازووبەند و مەچەك بەندێکی زێڕی بەخشی. خەڵکانی بەغداد لەڕۆژئاوا گەڕانەوە. شەڕ لەسەر دەستی فێڵباز و سەرسەرییەکان ئەنجامدرا و ئەوان زیاتر لەهەموان بوێریان لەخۆیان

نیشاندا.

محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر لەهەژدەی سەفەر/ بیست و دووی مارس مەبەستی شەماسییەی کرد و فەرمانیدا ماڵەکان، دوکانەکان و باخەکانی ئەو لای دیوار وێران بکەن. ئەو سێ دەروازەی وێران کرد تا گۆڕەپانی جەنگ پان و بەرین بێت.

لەم کاتەدا لەپارس و ئەهواز سامانێك بەهاوڕێیەتی مەنکجوری ئەشروسنی لەرێگەدا بوو. باوکی ئەحمەد تورکەکانی بۆ تالآن کردنی سامانەکە ڕەوانە کرد. لەملا محەممەد کوڕی عەبدوللە بۆ پارێزگاری کردن لەکاروانەکە، دەستەیەك سەربازی نارد. ئەوان سامانەکەیان لەرێگەیەکی دیکەوە هێنایە ناو بەغداد. کاتێك تورکەکان ئەم هەواڵەیان بیست، رێگەی نەهرەوانیان گرتەبەر و خوێنیان ڕشت و کەشتییەکانی پردەکەیان سوتاند کەژمارەیان بیست کەشتی بوو. دواتر بۆ سامەڕا گەڕانەوە.

محەممەد کوڕی خالید کوڕی یەزید کوڕی مەزید (لەبنەماڵەی مەعن کوڕی زائیدەی شەیبانی کە بەبوێری و ئازایەتی بەناوبانگ بوو) کەموستەعین، سنوورەکانی جەزیرەی بەو سپاردبوو؛ چاوەڕوانی سوپا و سامانی دەکرد تا بەرەو سنور بڕوات. کاتێك بارودۆخی موستەعین و تورکەکان بەم شێوەی لێهات، محەممەد کوڕی خالید لەگەڵ هاوەڵانی لەرێگەی رەققەوە بەرەو بەغداد بەرێکەوت. هاوڕێیانی ئەو چوارسەد کەس بوون. محەممەد کوڕی عەبدوللە پێنج خەڵاتی پێ بەخشی. دواتر لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەیوب کوڕی ئەحمەد، ڕەوانەی کرد. ئەو رێگەی فوراتی گرتەبەر و لەگەڵ ژمارەیەکی کەم رووبەرووی بوویەوە بەڵام محەممەد تێکشکا و پەنای بۆ گوندێکی دەوروبەری عێراق برد. کاتێك محەممەد کوڕی عەبدوللە هەواڵی شکستی ئەوی بیست، وتی: هیچ کام لەعەرەبەکان سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت مەگەر ئەوەی پێغەمبەرێك لەناویاندا بێت تا خواوەند بەهۆی ئەوەوە سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت.

تورکەکان لەدەروازەی شەماسییە جەنگێکی بوێرانەیان کرد و خۆڕاگرییان کردە پیشە و هەموو سەربازەکانی دەروازەکەیان بەپاشەکشێ کردن ناچار کرد. ئاگر و

نەوتیان خستە ناو قەڵاکوتەکان و هەڵیاندا بەڵام ئاگر نەکەوتەوە. دواتر ژمارەی بەرگریکارانی دەروازەکە زیادی کرد و ژمارەیەکی زۆر لەتورکەکانیان کوشت و بریندار کرد. لەم کاتەدا محەممەد بەتۆپ هاوێژەکان بەردەوام هێرشی دەکردە سەریان و نزیکەی سەد کەسی لێ کوشتن. یەکێك لەمەغریبییەکان خۆی گەیاندە دیوارەکە، کەمەند و قولابی هەڵدا و خۆی هەڵواسی. پاسەوانەکانی دیوار ئەویان کێشایەسەر و خوێنیان ڕشت و سەریان بڕی و سەرە بڕاوەکەیان هەڵدایە ناو سەربازە تورکەکان. تورکەکان بۆ ئوردووگای خۆیان گەڕانەوە. یەکێك لەپاسەوانەکانی دیوارەکە ویستی هاوار بکات: یا موستەعین، یا مەنسور بەڵام هاواری کرد: یا موعتەز! یا مەنسور، هاوەڵانی گومانیان کرد یەکێك لەمەغریبییەکانە و کوشتیان.

ڕۆژێکی دیکە تورکەکان مەبەستی دەروازەی شەماسییەیان کرد. لەم ناوەدا دەرغەمان، پاڵەوانی مەغریبییەکان کەپیاوێکی بوێر بوو، بەهۆی بەرکەوتنی بەردێك کە لەقەڵاکوتەکانەوە هەڵدرابوو، مرد. یەکێك لەمەغریبییەکان هێرشی دەبرد و پشتی دەکردە دوژمن،، شەرمی خۆی نیشان ددا و هاواری دەکرد، تیرێکی دەهاویشت و دەگەڕایەوە. یەکێك لەسەربازەکانی محەممەد تیرێکی بۆ هاویشت و ئەو شوێنەی کەنەدەبوا بریندار ببێت، بریندار بوو و گیانی گرت.

دوای شکستی تورکەکان، خەڵکانی کۆڵان و بازاری سامەرا کۆبوونەوە و بازاڕی زێرنگەران و بازارەکانی دیکەیان تاڵان کرد. بازرگانەکان سکاڵایان بۆ لای ئیبراهیم مۆئەییەد برد. ئەو کەنەیدەتوانی هیچ بکات، پێی وتن: شیاو بوو کاڵاکانتان بۆ ماڵەوە ببەن. ئەو هیچی نەکرد و کردەوەی تاڵانکەرانی بەقێزەون لەقەڵەم نەدا.

لەبیست و دووی سەفەر/ بیست و شەشی مارس، دەستەیەك لەسنور نشینەکان هاتنە ناو بەغداد و سکاڵایان لەفەرماندەی سنوردارەکان کرد. بەپێی وتەی ئەوان، کاتێك لەبەیعەتی موعتەز ئاگادار بوویەوە، پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ موعتەزی بەخەڵکان کرد و خەڵکی بۆ ئەو کارە ناچار کرد. هەرکەس ڕازی نەدەبوو، قامچی لێدەدرا و زیندانی دەکرا.

ئەوان دەیانوت بەیعەتیان نەکردووە و هەڵاتوون. وەسیف وتی: گومان دەکەم

ئەو گومانی کردووە موستەعین مردووە و موعتەز لەجێگەی ئەو وەك خەلیفە دەستنیشان کراوە. ئەوان وتیان: کردەوەکانی ئەو دەست ئەنقەستە. لەبیست و شەشی سەفەر/ سی مارس نامەی بەلکاجور گەیشت. ئەو لەنامەکەدا نوسیبووی بەیعەتی لەگەڵ موعتەز کردووە بەڵام کاتێك نامەی موستەعینی بەدەست گەیشتووە و (زانیویەتی موستەعین زیندووە) رێزی لەبەیعەتەکەی گرتووە و گوێرایەڵی فەرمانەکانی موستەعینە.

موسا کوڕی بوغا ( کە لەسامەرا بوو و لەجەنگی حیمس گەڕابوویەوە و هاوکاری موعتەزی کردبوو) ویستی هەڵێت و پەیوەستی موستەعین ببێت بەڵام هاوەڵە تورکەکانی ئاگادار بوونەوە و رێگەیان لێگرت. شەڕ دەستی پێکرد و ژمارەیەك کوژران.

دوای ماوەیەك چەندین کەشتی تۆپ هاوێژ هاتن کە لەهەرکامدا چل و پێنج نەوت هاوێژ و کەسانی دیکە دەبینرا. ئەوان لەکەنارەکانی شەماسییە گوزەریان کرد و ئوردووگاکەی باوکی ئەحمەدیان ئاگر باران کرد. بەڵام ئوردووگایان بۆ شوێنێك گواستەوە کەئاگر پێی نەدەگەیشت.

لەبیست و نۆی سەفەر/ پێنجی ئاوریل، تورکەکان بەرەو دەروازەکانی بەغداد پێشڕەوییان کرد و جەنگان. لەهەر دوو سوپا ژمارەیەك کوژران. ئەم جەنگە تا ئێواریٚ بەردەوام بوو.

لەسەرەتای رەبیع الاوەل/ ئاوریل، محەممەد کوڕی عەبدوللە کافرکوتەکانی (گورز، چوماق) دروست کرد و لەناو فێڵباز و سەرسەرییەکانی بەغداد بڵاوی کردەوە. ئەوان داری تەڕیان هەڵگرت و روویان کردە دەروازەکان، وەشاندیان و کوشتیان و پاشەکشێیان بەتورکەکان کرد. نزیکەی پەنجا تورکیان کوشت.

لەچواردەی رەبیع الاوەل/ شانزەی ئاوریل، موزاحیم کوڕی خاقان لەکەنارەکانی ڕەقە گەیشتە بەغداد. خەڵکان پێشوازییان لەخۆی و هاوەڵانی کرد کەنزیکەی هەزار پیاو دەبوون. کاتێك هاتە ناو بەغداد، حەوت خەڵاتیان پیٚ بەخشی و شمشێرێکیان بەکەمەرییەوە بەست.

موعتەز، سوپایەکی سیٚ هەزار کەسی ڕەوانە کرد. ئەوان لەبەرابەر ئوردووی

باوکی ئەحمەد، نزیك دەروازەی قوتەربول ئوردوویان لێدا. محەممەد کوڕی عەبدوللە خۆی سوار ئەسپ بوو و ژمارەیەکی زۆر لەپاسەوانەکان هاتنەدەر. محەممەد کوڕی عەبدوللە لەبەرابەر سوپاکەی باوکی ئەحمەد ئوردووی لێدا. لەنێوان ئەوان لەئاو و وشکانی چەندین جەنگ روویدا و زیاتر لەپەنجا کەس لەهاوەڵانی باوکی ئەحمەد کوژران. پێشەنگەکان پێشڕەوییان کرد و زیاتر لەنیو فەرسەخ لەئوردووگا پێشڕەوییان کرد. چەند کەشتی لەئوردووگای باوکی ئەحمەد رووبەروویان بوویەوە. کرێکارەکانی ناو کەشتییەکان جوێنیان پێ دەدان. محەممەد کوڕی عەبدوللە گەڕایەوە و فەرمانی بەباوکی عەوندا هێزەکانی بگەڕێنێتەوە. ئەویش فەرمانی گەڕانەوەی دەرکرد بەڵام خەڵکان رازی نەبوون و بەشێوەیەکی توند وەڵامیان دایەوە. باوکی عەون سەرکۆنەی کردن، ئەوانیش بەهەمان شێوە باوکی عەونیان سەرکۆنە کرد. کوڕی باوکی عەون لەیەکێك لەوانیدا و خوێنی ڕشت. هەمووان هێرشیان کردەسەر بەڵام ئەو هەڵات. لەم بگرە و بێنەدا سوپاکەی باوکی ئەحمەد هێرشی کرد و دەستیان بەسەر چوار کەشتیدا گرت و کەشتییەکیان سوتاند.

هەمووان هێرشیان کردە سەر ماڵەکەی باوکی عەون تا تاڵانی بکەن. دەوترا ئەو لەگەڵ تورکەکان رێککەوتووە. هاوەڵانی باوکی عەون هەڵاتن. ئەوان قسەیان لەگەڵ محەممەد کوڕی عەبدوللە کرد تا فەرماندەیی لەباوکی عەون وەربگرێتەوە. محەممەد کوڕی عەبدوللە ئەوی لابرد و رێگەی لەتاڵان و ئاژاوەگێڕی گرت.

لەیانزەی رەبیع الاوەل/ سیانزەی ئاوریل، ئەو سوپایەی موعتەز بۆ هاوکاری براکەی ڕەوانەی کردبوو، گەیشت و لەعوکبرا پەیوەستی یەکبوون. مناڵەکەی تاهیر سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەم سوپا تازەیە ڕەوانە کرد. ئەوان ملی رێگەیان گرتەبەر تا گەیشتنە قوتەربول. ئەمە ئەو شوێنەبوو تورکەکان بۆسەیان نابوویەوە. تورکەکان هێرشیان کرد و شەڕێکی قورس دەستپێکرد و ژمارەیەك کوژران. هاوەڵانی محەممەد کوڕی عەبدوللە بەرەو دەروازەی قوتەربول پاشەکشێیان کرد و تورکەکان شوێنیان کەوتن. دواتر خەڵکان بۆ هاوکاری کردنی ئەوان هاتن و پاشەکشێیان بەتورکەکان کرد. دواتر تورکەکان هێرشیان کردە سەر

بەغدادییەکان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. ژمارەیەکی بەرچاویش لەتورکەکان کوژران. لەم کاتەدا تورکەکان بەرەو دەروازەی قوتەیعە بەرێکەوتن و دیوارەکەیان رووخاند. خەڵکانی بەغداد یەکەم کەسیان کوشت کە لەم کەلێنەوە هاتە ناو شارەکە. لەم رۆژەدا کوژراوی تورکەکان زیاتر و بریندارەکان بەتیر لەخەڵکانی بەغداد فراوانتر بوون.

عەبدولله کوڕی عەبدولله کوڕی تاهیر، داوای هاوکاری لەخەڵك کرد و خەڵکان وەڵامیان دایەوە. ئەو فەرمانی بەدەرگاوانی قوتەربولدا مۆڵەتی هاتنە ناو بەهیچ هەڵاتوویێك نەدات. ئاگری جەنگ هەڵگیسرا و هاوەڵانی عەبدولله شکستیان خوارد و ئەسەد کوڕی داود تا سەرەمەرگ، خۆڕاگری کرد. داخستنی دەرگاکان لەسەر هەڵاتوان ناخۆشتر لەجەنگ لەگەڵ تورکەکان بوو چوونکە رێگەی هەڵاتنیان نەبوو. تورکەکان ژمارەیەکی زۆریان لەوان گرت و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و سەرە بڕاوەکانیان لەگەڵ ئەسیرەکان بۆ سامەرا نارد. کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتنەوە، سەرەکانیان داپۆشی چوونکە کاتێك خەڵکانی سامەرا ئەوانیان بینی، دەستیان بەگریان کرد، یەخەی خۆیان دڕی و ژنان شین و ڕۆڕۆیان دەستپێکرد. ئەمە بووە هۆی ئەوەی موعتەز لەتوڕەیی خەڵکەکەی ترسا. لەبەر ئەمە هەر ئەسیرێك و دینارێکی پێدا و فەرمانیدا سەرەکان بەخاك بسپێرن.

لەم کاتەدا باوکی ساج لەبیست و شەشی رەبیع الاوەل/ بیست و هەشتی ئاوریل لەرێگەی مەککەوە هات و خەڵاتی پێ بەخشرا.

لەکۆتایی رەبیع الاوەل/ دوەمی مەی، دەستەیەك لەتورکەکان هاتنە دەروازەی شەماسییە. ئەوان هەڵگری نامەیەکی موعتەز بوون کە بۆ محەممەد کوڕی عەبدولله نوسرابوو. هاوەڵانی داوای مۆڵەتیان کرد تا نامەکە وەربگرن. محەممەد مۆڵەتی پێدان. لەم نامەدا پەیمانی پێشووی محەممەد ئاماژەی پێدرابوو موعتەز بیری دەهێنایەوە کەمحەممەد دەبوا یەکەم کەس بێت بۆ سەقامگیری خەلافەتی موعتەز هەوڵ بدات. محەممەد وەڵامی ئەم نامەی نەدایەوە. جەنگ و شەڕ لەحەوتی رەبیع الاوەل/ نۆی ئاوریل دەستی پێکردەوە. لەم جەنگەدا حەوتسەد کەس لەتورکەکان و سێسەد کەس لەهاوەڵانی محەممەد کوژران.

لەنیوەی رەبیع الاخر/ حەڤدەی ئاوریل، باوکی ساج و عەلی کوڕی فەراشە و عەلی کوڕی حەفس فەرمانی بەرێکەوتن بەرەو مەدائینیان پێدرا. باوکی ساج بە محەممەد کوڕی عەبدوللەی وت: ئەگەر بڕیارت داوە بەبڕشتانە لەگەڵ تورکەکان بجەنگیت، بڵاوە بەسەرکردەکانی خۆت مەکە و لەیەك شوێندا کۆیان بکەرەوە تا ئەو سوپایەی لەبەرابەر تۆ ئوردووی لێداوە، تێکی بشکێنیت و هەرکات شکستت بەوان هێنا، چیتر کەس ناتوانێت سەرکەوتن بەسەر تۆدا بەدەست بێنێت. محەممەد کوڕی عەبدوللە وتی: بۆچوونێکم هەیە و تەنیا خواوەندم بەسە.؟ باوکی ساج وتی: هەر فەرمانێك بدەیت، فەرمانبەرم. باوکی ساج رێگەی مەدائینی گرتەبەر و لەوێ خەندەکی هەڵکەند و محەممەد کوڕی عەبدوللە لەگەڵ سێ هەزار سوار و دوو هەزار پیادە هاوکاری کرد. موعتەز نامەیەکی بۆ باوکی ئەحمەدی برای نووسی و بۆ کەمتەرخەمی لەجەنگ دژی بەغدادییەکان سەرکۆنەی کرد. باوکی ئەحمەد بەم هۆنراوەیە وەڵامی دایەوە:

| | |
|---|---|
| لامر المنايا علينا طريق | و للدهر فينا اتساع و ضيق |
| و ايامنا عبرة للانام | فمنها البكور و منها الطروق |
| و منها هنات تشيب الوليد | و يخذل فيها الصديق الصدوق |
| و فتنة دين لها ذروة | تفوق العيون، و بحر عميق |
| فتال متين و سيف عتيد | و خوف شديد و حصن وثيق |
| و طول صياح لداعي الصباح الـ | سلاح السلاح فما يستفيق |
| فهذا طريح و هذا جريح | و هذا حريق و هذا غريق |
| و هذا قتيل و هذا تليل | و آخر يشدخه المنجنيق |
| هناك اغتصاب و ثم انتهاب | و دور خراث و كانت تروق |
| اذا ما شرعنا الى مسلك | و جدناه قد سد عنا الطريق |
| فبا لله نبلغ ما نرتجي | و بالله ندفع ما لا نطيق |

واتاکەی: مەرگ رێگەی بۆ لای ئێمەیە، رۆژگارێش بەرزی و نزمی هەیە. رۆژگاری ئێمە بۆ خەڵکان هۆکارێکە بۆ وانە وەرگرتن و ئەم رۆژگارە هەندێ کات لەبەیانیدا روودەدات هەندێ کات لەئێوارێدا. لەم رۆژگارەدا بەشێك لەرووداوەکان

مووی ڕەشی منالٚ سپی دەکات و هاوریٚ، هاوکاری خۆی لەهاوریٚ دریٚغ دەکات. فیتنەیەك لەدیندا دەرکەوتووە کە بەلاٚکەی لەلافاوەکان و هەلٚکشانی ئاوی دەریاکان، مەترسیدارترە. جەنگێکی سەخت و شمشێرێکی بڕەڕ و ترسێکی هەژێنەر و قەلاٚیەکی بەهێز لەئارادایە. هاوارەکانی بەردەوامی هاوارکەرێك کەهاوار دەکات، کەرەستەی جەنگ، کەرەستەی جەنگ، بەلاٚم کەس نایێتە هۆش خۆی. یەکێك کەوتۆتە سەرزەوی و یەکێك بریندار بووە و یەکێك سووتاوە و یەکێك خنکاوە. یەکێك کوژراوە و یەکێك لەسەر جێگەیە و سەرئەنجام یەکێك بەقەلاٚکوت سەری شکاوە. لەشوێنێك دزی و لەشوێنێك تالاٚن کردن و مالٚەکان وێران بوون کەپێشتر مرۆڤەکان تامەزرۆی ژیان لەناویاندا بوون. هەرکات بمانەوێت ڕێگەیەك ببڕین دەبینین ڕێگەکان بەستراون. سوێند بەخوا بەهیواکەی خۆمان دەگەین و سوێند بەخوا ئەوەی شیاوی خۆڕاگری نییە، پشتگویٚ دەخەین.

شاعیری ئەم هۆنراوەیە عەلی کوڕی ئومەییە لەکێشەی نێوان مەئمون و ئەمینە.

## ڕووداوەکانی ئەنبار

محەممەد کوڕی عەبدوللە، نەجوبە کوڕی قەیسی بۆ ئەنبار نارد. ئەو لەویٚ مایەوە و نزیکەی دوو هەزار بەکرێگیراوی کۆکردەوە. محەممەد کوڕی عەبدوللە، هەزار و پێنسەد کەسی بۆ هاوکاری ئەو نارد. ئاوی لەفوراتەوە بۆ خەندەکی هەرات گواستەوە و ئاو بەرادەیەك لەبیابانەکان کۆبوویەوە کەهاوشێوەی زۆنکاویان لێهات. هەروەها هەموو پردەکانی وێران کرد (تارێگە لەدوژمن بگرێت). موعتەز سوپایەکی بەفەرماندەیی عەلی ئیسحاقی بۆ ئەنبار ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەگەلٚ گەیشتنی هێزە پشتیوانەکانی محەممەد کوڕی عەبدوللە گەیشتە ئەنبار. ئەوان لەدەوروبەری شار ئوردوویان لێدابوو. لەنێوان دوو سوپا جەنگێکی قورس دەستپێکرد. لەم جەنگەدا هێزە پشتیوانەکانی محەممەد کوڕی عەبدوللە شکستیان خوارد و لەهەمان ڕێگەی کەهاتبوون، بۆ بەغداد گەڕانەوە. نەجوبە لەئەنبار بوو و لەشارەکە نەدەهاتەدەر. کاتێك هەوالٚی شکستی هێزە پشتیوانەکان و هێرشی تورکەکانی بۆ سەر خۆی بیست، لەبەشی ڕۆژئاوا گوزەری کرد و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە، حسەین کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمی لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان و سەرکردەکان بۆ ئەنبار ڕەوانە کرد. توێشوو و هێزی خستە بەردەستیان و ڕۆژانەی چوار مانگی پێدان. سوپا بەرێکەوت و حسەین بەناویاندا سووڕایەوە و لەپێنجشەممە، بیست و سێی جومادی الاوەل/ بیست و سێی ژوئەن بەرەو ئەنبار بەرێکەوت. خەڵکان و فەرماندەکان و منداڵەکانی هاشم تا یاسریە بەرێیان کرد.

کاتێك تورکەکان هاتنە ناو ئەنبار، ئەمانیان بەدانیشتووانی شارەکە بەخشی. ئەوانیش دووکان و بازارەکانیان کردەوە و کەشتییەکان لەرەقەوە بەرەو شارەکە هاتن کەئارد و ڕۆن و شتەکانی دیکەی هەڵگرتبوو. تورکەکان کەشتییەکانیان تاڵان کرد و دەستیان بەسەر هەموو شتەکاندا گرت و ڕەوانەی ماڵەکانی خۆیان لەسامەرا کرد. ئەوان ئەسیرەکان و سەر بڕاوەکانیشیان بۆ سامەرا نارد.

حسەین گەیشت و لەدیمەم ئوردووی لێدا. پێشەنگەکانی تورك لەسەرەوەی دیمەمەوە هاتن. حسەین سوپاکەی لەبەرابەر تورکەکان ڕازاندەوە. ڕووبارێك ئەم دوو سوپای لەیەك جیا دەکردەوە. دە هەزار شەڕکەر لەناو سوپاکەی حسەیندا بوون. تورکەکان لەسەرەوەی دیمەم جێگیر و حسەین سەرقاڵی ڕازاندنەوەی سوپاکەی بوو. تورکەکان زیاتر لەهەزار کەس نەبوون. تورکەکان تیریان هاویشت و دەستەیەك لەسەربازەکانی حسەینیان بریندار کرد و بۆ ئەنبار گەڕانەوە. حسەین پێشڕەوی کرد و گەیشتە شوێنێك بەناوی قوتەیعە. ئەم شوێنە بەربڵاو و حسەین سوپاکەی خۆی لەوێ جێگیر کرد. حسەین یەك ڕۆژی لەوێ بەسەر برد و دواتر مەبەستی نزیك بوونەوە لەئەنباری کرد. سەرکردەکانی سوپا داوایان لێکرد ئوردووگاکەی لەم شوێنەدا لێ بدات و لەگەڵ سەربازە سوارەکان بەرێکەوێت. ئەگەر سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دەتوانێت سوپاکەی بۆ پێشەوە ببات و ئەگەر شکستی خوارد دەتوانێت بۆ ئوردووگاکەی بگەڕێتەوە و سەر لەنوێ هێرش بکاتە سەر دوژمن. حسەین بەم پێشنیارە ڕازی نەبوو و ئەو شوێنەی بەجێهێشت.

کاتێك حسەین بەشوێنی مەبەستی خۆی گەیشت، فەرمانی دابەزینی بەسوپاکەیدا. سیخوڕەکانی تورك شوێنەکەی حسەین و شوێنی سوپاکەی حسەین

و تەنگی ئەم شوێنەیان بەتورکەکان گەیاند. سوپاکەی حسەین سەرقاڵی داگرتنی بارونبە بوون کەتورکەکان هێرشیان کردە سەریان. سوپا شڵەژا و سوپاکەی حسەین جەنگی دژی تورکەکان دەستی پێکرد و لەهەردوو سوپا ژمارەیەکی زۆر کوژران. شوێنکەوتەکانی حسەین هێرشیان کردە سەر تورکەکان و پاشەکشێیان پێکردن و دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ئەواندا گرت و ژمارەیەکی زۆریان خنکاند. تورکەکان پێشتر بۆسەیان دانابوو. ئەوان لەحەشارگەکانیان هاتنەدەر. سوپاکەی حسەین جگە لەفورات هیچ ڕێگەیەکی هەڵاتنیان نەبوو و بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی خنکان و دەستەیەکیان ئەسیر و ژمارەیەکیان کوژران.

سوارەکان بێ ئەوەی بتوانن پەنا بۆ شوێنێك ببەن، هەڵاتن. سەرکردەکان، ئەوانیان بانگ دەکرد: بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە بەڵام کەس نەگەڕایەوە. دوای ماوەیەك ئەوان هاتنە خۆ و بۆ گیانی خۆیان ترسان و بەهۆی ئەم ترسەوە گەڕانەوە و پشتی هاوەڵانیان گرت. تورکەکان سامان و کەرەستەکانی سوپاکەی حسەینیان تاڵان کرد و تەنیا کەرەستەکانی جەنگی حسەین تاڵان نەکرا لەبەر ئەوەی لەناو کەشتییدا بوو و مەلەوانەکان پارێزگارییان لێدەکرد. هەڵاتووان لەشەشی جومادی الاخرە/ شەشی ژوئەن گەیشتنە یاسریە. پیاوێك لەبازرگانە ئیفلاسەکان، حسەینی بینی و پێی وت: سپاس بۆ ئەو خوایەی ڕووڕشی کردی، ئایا ڕۆشتن بەو هەموو توانا و توێشووە دوانزە ڕۆژی خایاند و گەڕانەوەت (لەترسی دوژمن) یەك ڕۆژی خایاند. حسەین وای نیشاندا ئەم قسەی نەبیستووە.

کاتێك محەممەد کوڕی عەبدوللە لەم شکستە ئاگادار بوویەوە، ڕێگەی هاتنە ناو بەغدادی لەهەڵاتووان گرت و هاواری کرد: دوای سێ ڕۆژ هەر کەس لەسوپاکەی حسەین لەناو بەغداد ببینم، سێسەد قامچی لێ دەدەم و ناوی لەدیوان دەسردرێتەوە. سوپا بەناچاری بۆ لای حسەین لەیاسریە گەڕانەوە. مناڵی عەبدوللە سوپایەکی دیکەی بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە کرد ومانگانەی پێدان. ئەو فەرمانیدا لەکوژراوەکان، خنکاوەکان و تەندروستەکان، ئامارێکی بۆ بێنن. ئەو کارەیان کرد. نامەیەك لەسیخوڕەکانی ئەوان لەئەنبار گەیشت کە بەهۆیەوە ژمارەی کوژراوانی

تورك، زیاتر لەدووسەد و ژمارەی بریندارەکان چوارسەد و ژمارەی ئەسیرەکان لەدەستی تورکەکان دووسەد و بیست پیاو و ژمارەی سەرە براوەکان حەفتا سەر بوو. سیخورەکان لەم نامەدا ئاماژەیان بەوەدابوو کەتورکەکان ژمارەیەك لەکەسانی بازاریان گرتووە و دواتر ئازادیان کردوون. حسەین دووبارە لەرۆژی هەژدەیەمی جومادی الاخرە/ هەژدەی ژوئەن بەرێکەوت و لەرووبارەی ئەربەق گوزەری کرد. لەرۆژی شەممە هەشتی رەجەب/ حەوتی ئوت، پیاوێك هاتە لای و ئاگاداری کردەوە کەتورکەکان دەیانەوێت بەگوزەر کردن لەرووبار هێرشی بکەنەسەر. حسەین لەو پیاوەیدا بەلاّم حسەین کوڕی عەلی کوڕی یەحیای ئەرمەنی لەگەلّ دووسەد سەرباز، لەکەناری رووبارەکە بەجێهێشت. تورکەکان هاتنە لای گوزەرگاکە و کاتێك سەربازەکانیان لەکەنارەکەدا بینی، لەرێگەیەکی دیکەوە ڕۆیشتن. حسەین کوڕی عەلی بۆ جەنگ لەگەلّ ئەوان پێداگری کرد و پەیامی بۆ حسەین کوڕی ئیسماعیل نارد کەتورکەکان لای رووبارەکە دابەزیون، هاوکارییان بکەن. بەنێردراو وترا: ئەمیر خەوتووە. حسەین کوڕی عەلی پەیکێکی دیکەی نارد، پێیان وت: ئەمیر لەسەر ئاوە. حسەین کوڕی عەلی کەسێکی دیکەی نارد، پێیان وت: ئەمیر خەوتووە. بەم شێوەیە تورکەکان لەرووبارەکە پەڕینەوە و حسەین کوڕی عەلی سوار بەلەمێك بوو و رێگەی خوارەوەی گرتەبەر و هاوەلاّنی هەلاّتن. تورکەکان ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و نزیکەی دووسەد کەسیان ئەسیر کرد. هەموو کەشتییەکان گەڕانەوە بێ ئەوەی زیانیان بەرکەوێت. تورکەکان شمشێریان دەرکێشا و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی حسەین خنکان و هەلاّتووان نیوە شەو گەیشتنە بەغداد و پاشماوەی ئەوان دوو رۆژی دواتر خۆیان گەیاندە بەغداد. تورکەکان دەستیان بەسەر ئەسپ و هاوەلاّنی حسەین گرت و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی حسەین کوژران. هندوانی ئەم هۆنراوەی بۆ حسەین هۆنییەوە:

یا احزم الناس رأیا فی تخلفه  عن القتال خلطت الصفو بالکدر

لما رأیت سیوف الترك مصلتة  علمت ما فی سیوف الترك من قدر

فصرت مضجرا ذلا و منقصة  و النجح یذهب بین العجز و الضجر

واتاکەی: ئەی ئەو کەسەی بۆ دواکەوتن لەجەنگ لەهەموو کەسەکان دوور ئەندێشتری، ڕەنگێکت تێکەڵ بەتاریکی کرد. کاتێك شمشێری تورکەکانت بینی، لەتوانای تیغی ئەوان ئاگادار بوویتەوە و لەریسوایی و زەلیلی بێزار بوویت، کەواتە بەختەوەری لەنێوان ناتەوانی وبێزاری لەناو دەچێت.

ژمارەیەك لەسکرتێرەکان و راوێژکاران و نوسەران و فەرماندەکان و منداڵەکانی هاشم لەبەغداد، پەیوەستی موعتەز بوون. لەناو منداڵەکانی هاشم، عەلی و محەممەد، کوڕەکانی واسق و کەسانی دیکە دەبینران.

لەنێوان دوژمن چەندین جەنگ روویدا و لەهەردوولا ژمارەیەك کوژرا. لەهەندێك لەم جەنگانە، تورکەکان هاتنە ناو بەغداد بەڵام خەڵکان بەپشتیوانی یەك، ئەوانیان لەشارەکە دەرکرد.

لەنێوان باوکی ساج و دەستەیەك لەتورکەکان جەنگ روویدا. باوکی ساج شکستی بەتورکەکان هێنا. ئەو جارێکی دیکە شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد بەڵام دەستەیەك لەهاوەڵانی بەتەنیا جێیان هێشت و تامی تاڵی شکستیان پێ چێشت. تورکەکان هاتنە مەدائین و ئەو تورکانەی دەستیان بەسەر ئەنباردا گرتبوو، لەلای رۆژئاواوە هێرشیان کردە سەر بەغداد و گەیشتنە سەرسەرِ و کۆشکی کوڕی هوبەیرە.

لەزیقەعدە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە جەنگێکی قورس روویدا. لەم جەنگەدا محەممەد کوڕی عەبدوڵلە کوڕی تاهیر لەگەڵ هەموو سەرکردەکان و سوپاییەکانی خۆی هاتە ناو گۆڕەپان. خێوەت و بارەگایان بۆ هەڵدا و ئاگری جەنگێکی ماڵوێرانکەر هەڵگیرسا. تورکەکان شکستیان خوارد و دانیشتوانی بەغداد هێرشیان کردە سەر ئوردووگاکەیان و ژمارەیەکی زۆریان کوشت. تورکەکان بێ ئەوەی سەیری هیچ بکەن، هەڵدەهاتن. خەڵك هەر سەرێکی دیکەیان دەهێنا، بوغا دەیوت: کاری موالییەکان تەواو بوو. ئەو تورکانەی هاورێی بوغا و وەسیف بوون، لەم قسەیە رەنجان.

باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل، تورکەکانی دەگەڕاندەوە و ئەوانی ترساند کەئەگەر نەگەڕێنەوە چیتر کەس لەوان نامێنێتەوە. بەغدادییەکان تا سامەرا

شوێنیان کەوتن بەڵام ئەوان گەڕانەوە و دەستەیەك لەدانیشتوانی بەغداد چیتر شوێن هەڵاتوان نەکەوتن. دەستەیەك ئاڵای تورکەکانیان بینی و گومانیان کرد تورکەکان گەڕاونەتەوە و بەناچاری هەڵاتن و بەکۆمەڵ هاتنە ناو بەغداد و تورکەکان گەڕانەوە بۆ ئوردووگاکەی خۆیان و لەهەڵاتنی بەغدادییەکان ئاگادار نەبوونەوە بۆ ئەوەی هێرشیان بکەنەسەر.

لەزیحەججە/ دێسامبەر، باوکی ئەحمەد پێنج کەشتی لەخۆراك و ئارد بۆ لای کوڕی تاهیر ڕەوانە کرد. هەروەها لەم مانگەدا خەڵکان زانیان کەکوڕی تاهیر موستەعینی لەسەر کار لابردووە و بەیعەتی لەگەڵ موعتەز بەستووە. کوڕی تاهیر سەرکردەکانی خۆی نارد تا بەیعەت لەگەڵ موعتەز ببەستن. لەکاتێکدا خەڵکان گومانیان دەکرد ڕێککەوتن بەو مەرجە بووە کەموستەعین لەسەر تەختی خەلافەت دانیشێت و موعتەز جێگری ئەو بێت.

لەمانگی زیحەججە/ دێسامبەر ڕەشید کوڕی کاوس برای ئەفشین کەپاسەوانی دەروازەی سەلامە بوو، ڕۆشتە لای تورکەکان. چاوی بەباوکی حامید کەوت. دواتر بۆ دەروازەکانی بەغداد گەڕایەوە و بەخەڵکی وت: سەروەری باوەڕداران موعتەز و باوکی ئەحمەد سڵاوتان لێ دەکەن و دەڵێن: هەرکەس فەرمان لەئێمە ببات، پەیوەستی دەبین و هەرکەس نافەرمانی بکات، خۆی زاناترە.

خەڵك جوێنیان پێدا چوونکە دەیانزانی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر چی لەدڵدا حەشارداوە. هەموان لەشارەوە بەرەو جەزیرە کەڕووبەڕووی ماڵەکەی محەممەد بوو، بەڕێکەوتن و قێزەونترین وشەکانیان هێنایە سەرزمان. دواتر ڕۆشتنە بەردەم ماڵەکەی و دووبارە جوێنبارانیان کرد و لەگەڵ پاسەوانەکانی ماڵەکەی جەنگان و بڵاوەیان پێکردن و گەیشتنە ناو دالان و ڕێڕەوی ماڵەکە و بڕیاریاندا بیسوتێنن بەڵام ئاگریان دەستنەکەوت. دەستەیەك لەوان شەو لەجەزیرە مانەوە و بەردەوام جوێنیان دەدا. کاتێك ناوی دایکی ئەویان هێنایە سەرزمان، پێکەنی و وتی: چۆن ناوی دایکم دەزانن لەکاتێکدا زۆربەی کەنیزەکانی باوکم نەیاندەزانی. بۆ بەیانی دووبارە جوێندان دەستی پێکردەوە. محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر ڕۆشتە لای موستەعین و داوای لێکرد قسەیان بۆ بکات و

هێوریان بکاتەوە. موستەعین ئەو کارەی کرد و وتی: محەممەد منی لەسەر کار لانەبردووە و ئەو گوناحە ناخەمە پاڵ ئەو. هەروەها بەڵێنی پێدان نوێژی هەینی لەگەڵ ئەوان بخوێنێت. بەم شێوەیە خەڵك بڵاوەیان لێکرد و ڕۆشتن.

دواتر نوێنەرەکانی محەممەد کوڕی عەبدوڵلە و باوکی ئەحمەد لەگەڵ حیماد کوڕی ئیسحاق کوڕی حیماد کوڕی یەزید هاتوچۆیان کرد و لەم ناوەدا دەستەیەك لەپیادەکانی سوپا و ژمارەیەکی دیکە شۆڕشیان کرد. سەربازەکان داوای ڕۆژانەیان دەکرد و کەسانی دیکە لەناسەقامگیری بارودۆخی خۆیان سکاڵایان بەرز کردەوە. ئەوان بە محەممەد کوڕی عەبدوڵلەیان وت: یا وەرەدەر و گفتوگۆمان لەگەڵ بکە یا برۆ وبەجێمان بێڵە. محەممەد بەڵێنی پێدان دێتەدەر و ڕێگەی سازانیان لەگەڵ دەگرێتەبەر. دواتر لەسەر دەروازە و جەزیرە وماڵەکەی خۆی پاسەوانی دانا. پاسەوانەکان خەڵکانیان دوور خستەوە وبۆ جەنگ هانیاندان.

محەممەد کوڕی عەبدوڵلە پەیامی بۆ سەربازەکان نارد و بەڵێنی دانی مانگانەی دوو مانگی پێدان و داوای لێکردن ئارام بگرن. ئەوان ڕازی نەبوون و وتیان: ڕازی نابین تا بزانین بارودۆخی ئێمە و ئەوان چۆنە (لەئاشتیداین یا لەجەنگ). محەممەد کوڕی عەبدوڵلە خۆی هاتەدەر و پێیان وت: خەڵکان بڕوایان وایە تۆ موستەعینت لەسەر کار لابردووە و بەیعەتت لەگەڵ موعتەز بەستووە وسەرکردەکانت بەردەوام بۆ لای باوکی ئەحمەد دەنێریت. خەڵك لەهاتنی تورك و مەغرببییەکان بۆ ناو بەغداد دەترسن و ئەگەر ئەو بەڵایان بەسەر نەهێنن کە لەمەدائین و ئەنبار کردیان (گرفتاری تاڵانی تورکەکان بوون) بۆ گیانی خۆیان و منداڵەکانیان دەترسن. داوایان لە محەممەد کوڕی عەبدوڵلە کرد خەلیفە بباتە لای ئەوان تا هەم بیبینن و هەم درۆ بوونی ئەوەی بیستبوویان، ئاشکرا ببێت. کاتێك محەممەد ئەمەی بینی، داوای لەموستەعین کرد بڕواتە لایان. ئەو بۆ دارئەلعامە هاتەدەر و دەستەیەك لەخەڵکان ڕۆشتنە لای و ئەویان بینی و هاتنەدەر و خەڵکیان ئاگادار کردەوە بەڵام خەڵکان ڕازی نەبوون. موستەعین فەرمانیدا دەرگاکان ببەستن و ڕۆشتە سەر بانی دارئەلعامە و محەممەد کوڕی عەبدوڵلە هاوڕێیەتی دەکرد. خەڵکان موستەعینیان بینی کەجل وبەرگی پێغەمبەری لەبەردا و داردەستەکەی بەدەستەوە بوو. لەگەڵ

خەڵك قسەی كرد. ئەوانی بەپێغەمبەر سوێنددا تا بگەڕێنەوە و دڵنیایی كردن لەوەی لەلایەن محەممەد كوڕی عەبدوللە زیانی پێناگات. خەڵك داوایان لەموستەعین كرد سوار بێت و بڕواتە لای ئەوان و لەماڵی محەممەد كوڕی عەبدوللە بڕواتەدەر چوونكە لە محەممەد كوڕی عەبدوللە بۆ گیانی ئەو دەترسن. موستەعین بەڵێنی پێدان.

كاتێك محەممەد كوڕی عەبدوللە ئەمەی بینی، بڕیاریدا لەبەغدادەوە بەرەو مەدائین بڕوات. دەستەیەك لەگەورەكان ڕۆشتنە لای و داوای بەخشینیان كرد. ئەم ئاژاوانەیان خستە ئەستۆی شۆڕشیەكان و ئاژاوەگێران. محەممەد بەشێوەیەكی چاكە وەلامی دانەوە و موستەعین لەمانگی زیحەججە/ دیسامبەر ماڵی محەممەدی بەجێهێشت و ڕووی كردە ماڵی ڕەزقی خزمەتكار لەروسافە. محەممەد كوڕی عەبدوللە لەپێش دەمی ئەو نیو ڕمی خەلافەتی هەڵگرتبوو. بۆ بەیانی خەڵكان لەروسافە كۆبوونەوە و داوایان لەسەركردەكان و منداڵەكانی هاشم كرد بڕۆنە ماڵی محەممەد كوڕی عەبدوللە و ئەو لەگەڵ خۆیان بێنن. ئەو كارەیان كرد. محەممەد لەگەڵ سەردارەكانی خۆی هاتەدەر و لەبەرابەر خەڵكان وەستا وسەركۆنەی كردن و سوێندی خوارد كە نەبۆ موستەعین و نە بۆ جێگرەكەی و نە بۆ هیچ كام لەخەڵكان خراپەی ناوێت و تەنیا خوازیاری سەقامگیر كردنی بارودۆخی ئەوانە تا ئەو جێگەی خەڵكان دەستیان بەگریان و دۆعایان كرد. محەممەد كوڕی تاهیر بۆ لای موستەعین بەرێكەوت. ئەو بۆ سەقامیگر كردنی بارودۆخی موستەعین هەوڵی زۆریدا تا ئەوەی عوبەیداللە كوڕی یەحیا كوڕی خاقان ئەندێشەی ئەوی گۆڕی و پێی وت: ئەو كەسەی تۆ هاوكاری دەكەیت و بۆ سەقامگیر كردنی بارودۆخ هەوڵی بۆ دەدەیت لەخراپترین و ناباوەڕترینی خەڵكانە. سوێند بەخوا فەرمانی بەوەسیف و بوغادا تۆ لەناو ببەن بەلام ئەم دوانە ئەو كارەیان بەگران و دەستیان بۆ شمشێر نەبرد. ئەگەر باوەڕ بەوتەكانی من ناكەیت، لێكۆڵینەوە بكە. ئەوەی بەڵگەیە بۆ دوو ڕوویی ئەو ئەوەیە لەسامەرا لەكاتی نوێژ بەهێواشی (بسم الله) دێنێتە سەرزمان و كاتێك دێتە لای تۆ، بەدەنگی بەرز ئەو كارە دەكات بەلام تۆ هاوكاری هاوڕێ و خزم و پەروەردەكەری خۆت پشتگوێ دەخەیت. عوبەیداللە بەردەوام ئەم وتانەی

بەگوێدا دەخوێند. محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە وتی: خواوەند ریسوای بکات چوونکە نەسوودی بۆ کاروباری دین هەیە نەسوودی بۆ کاروباری دنیا. دواتر عوبەیدالله کوڕی یەحیا، ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل و حەسەن کوڕی مەخلەدی کردە هاوڕێی خۆی.

لەجەژنی قوربان، موستەعین نوێژی لەگەڵ خەڵکان خوێند. دواتر محەممەد کوڕی عەبدولله لەگەڵ فەقیە و قازییەکانی هاوڕیی هاتە لای موستەعین و پێی وت: تۆ لەسەر ئەو بنەمایە لەمن جیابوویتەوە کەمەبەستەکانی من جێبەجێ بکەیت. تۆ لەمبارەوە نووسراوێکت لای من هەیە. موستەعین وتی: بیهێنە. محەممەد هێنای. تیایدا باسی ئاشتی و ئاسایش کرابوو و ئاماژە بەلەکار لابران نەدرابوو. موستەعین وتی: بەڵێ، پەرە بەئاشتی و ئاسایش بدە. محەممەد کوڕی عەبدولله ڕۆشتەدەر و لەدەرەوەی دەروازەی شەماسییە خێوەتی هەڵدا. دەستەیەك لەهاوەڵانی هاوڕێیەتیان دەکرد. باوکی ئەحمەد بەبەلەمێك پەیوەستی بوو. گفتوگۆیان کرد و دواتر هاتنەدەر. محەممەد کوڕی تاهیر هاتە لای موستەعین و ئاگاداری کردەوە کەپەنجا هەزار دیناری پێ دەدرێت و سی هەزار دینار مانگانە وەردەگرێت و ئازاد دەبێت لەوەی لەناو شاری بەغداد بمێنێتەوە و سەردانی حەج بکات بەو مەرجەی خۆی لەخەلافەت بەدوور بگرێت و فەرمانڕەوایی هەموو سەرزەمینی حیجاز بەبوغا بسپێرێت و لوڕستان و ناوچەکانی دەوروبەری بەوەسیف بدات. یەك لەسەر سێی سامانەکان بۆ محەممەد کوڕی عەبدولله و سوپای بەغداد و دوو لەسەر سێی بۆ موالییەکان و تورکەکان بێت. موستەعین رازی نەبوو دەست لەخەلافەت هەڵگرێت. گومانی دەکرد وەسیف و بوغا لەگەڵ ئەودا دەبن. موستەعین وتی: ئەوە گەردنی من و ئەوە شمشێر و ئەوە سفرەی چەرمی.[٢٥] محەممەد کوڕی تاهیر وتی: من لێرە دەمێنمەوە و تۆ چ بتەوێت وچ نەتەوێت دەبێت دەست لەخەلافەت هەڵگریت. موستەعین سەرئەنجام رازی بوو دەست لەخەلافەت هەڵگرێت.

چۆنیەتی رازی بوونی ئەو بۆ دەست کێشانەوە لەخەلافەت بەم شێوە بوو کە محەممەد کوڕی عەبدولله و بوغا و وەسیف سەبارەت بەدەست کێشانەوە

---

[٢٥] ئەم سفرەیان لەژێر دەستی جەلادەکان دادەنا بۆ ئەوەی خوێنەکە بلاو نەبێتەوە. (وەرگێڕ)

لەخەلافەت قسەیان لەگەڵ کرد و ئەو بەشێوەیەکی توند وەڵامی دانەوە. وەسیف بەموستەعینی وت: تۆ فەرمانی کوشتنی باغەرت بەئێمەدا و بارودۆخی ئێمەت بۆ ئەم شێوەیە گۆڕی. فەرمانت دا خوێنی ئوتامش بڕێژین و پێت وتین محەممەد کوڕی عەبدوللە چاکەخوازی ئێمە نییە و بەردەوام ئەویان دەترساند و هەڕەشەیان لێدەکرد. محەممەد وتی: تۆ بەمنت وت بارودۆخی ئێمە سەقامگیر نابێت مەگەر ئەوەی یەکێك لەم دوانە (بوغا و وەسیف) لەناو بچن. کاتێك موستەعین ئەمەی بینی، بەدەست لەکارکێشانەوە رازی بوو و نیازەکانی خۆی نووسی. ئەم رووداوە لەیانزەی زیحەججە/ پێنجی ژانویە روویدا. محەممەد کوڕی عەبدوللە فەقیە و قازییەکانی کۆکردەوە و هەموویانی بردەی لای موستەعین و ئەوانی کردە شایەت کەموستەعین کاروبارەکانی خۆی بە محەممەد کوڕی عەبدوللە سپاردووە. لەگەڵ ئەوەیشدا گەوهەرەکانی خەلافەتی لیٚ سەند.

محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر پەیکی بۆ لای سەرکردەکانی خۆی نارد تا پەیوەستی ببن. هەر سالارێك دەبێت دەکەس لەهاوەڵە گەورەکانی لەگەڵدا بێت. محەممەد هیوای پێبەخشین و وتی: لەکردەکەی خۆم جگە لەرێگرتن لەخوێنڕشتن و ساماندانی بارودۆخ و پاراستنی ئێوە، هیچ مەبەستێکی دیکەم نەبووە. فەرمانی پێدان بڕۆنە سامەرا و بەیعەت لەگەڵ موعتەز ببەستن و لەمەرجەکانی دەست لەکارکێشانەوەی موستەعین ئاگاداری بکەنەوە و نامەکەی تەسلیم بکەن بۆ ئەوەی واژۆی بکات. ئەوانی بۆ لای موعتەز نارد و ئەوان ڕۆشتنە بارەگاکەی موعتەز. موعتەز بەداواکارییەکانی ئەوان رازی بوو و بەپێنوسی خۆی واژۆی کرد و نێردراوان وەك شایەت لەقەڵەم دران. موعتەز خەڵاتی کردن و کەسی لەگەڵدا ناردن بۆ ئەوەی بەیعەت لەموستەعین وەربگرێت. دایك و بنەماڵەی موستەعین بەفەرمانی موعتەز لەسامەراوە بران بۆ بەغداد. پێش ڕۆشتن بەوردی ئەوانیان پشکنی و ئەوەی پێویست بوو، لێیان سەندن. ڕۆشتنی نێردراوانی موعتەز بۆ بەغداد لەشەشی موحەڕەمی ساڵی ٢٥٢/ بیست و حەوتی فەروریەی ٨٦٦ زایینی بوو.

## جەنگی فەرەنگەکان لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمانی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، سوپایەکی بەفەرماندەیی کوڕەکەی، مونزەر لەمانگی جومادی الاخرە/ مەی بۆ سەرزەمینی ناباوەڕان ڕەوانە کرد. ئەوان بەرێکەوتن و روویان کردە مەلاحە. سامان و دارایی لوزریق زیاتر لەکەنارەکانی ئەلبە و قەلآکان بوو. کاتێك موسوڵمانان بۆ وێران و تالآن کردن بڕیاریاندا، لوزریق سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر موسوڵمانانی کرد. دوو سوپا لەشوێنێك بەناوی فەج مەرکوین، کە ئەم جەنگە بەو ناوە ناسرا، رووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. ناباوەڕان شکستیان خوارد بەڵام لەگۆڕەپان دوور نەکەوتنەوە و لەبەرزاییەکی نزیك گۆڕەپانەکە کۆبوونەوە. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و هێرشیان کردنەسەر و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. ناباوەڕان بێ ئەوەی سەیری دواوە بکەن، هەڵاتن. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و لەرێگەدا ئەسیر و دواتر کوشتیانن.

ئەم جەنگە لەدوانزەی ڕەجەب/ یانزەی ئۆگۆست روویدا. موسوڵمانان لەناباوەڕان دوو هەزار و چوارسەد و نەوەد و دوو کەسیان سەر بڕی و گەڕانەوە.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی محەممەد هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەکی فراوان و کەرەستەی جەنگی زۆر لەتەبەرستانەوە گەڕایەوە بۆ گورگان. عەبدوللە کوڕی تاهیر بۆ ئەم کارە ناچاری کرد. حەسەن کوڕی یەزید لەتەبەرستان ڕۆشت و پەنای بردە بەر دەیلەمییەکان. سلێمان هاتە تەبەرستان و مەبەستی ساری کرد. دوو منداڵەکەی قارن کوڕی شەهریار و دەستەیەك لەدانیشتوانی ئامول و کەسانی دیکە کەپەشیمان ببوونەوە، پەیوەستی بوون و داوای بەخشینیان لێدەکرد. ئەوانی بەخشی و رێگەی کوشتن و تالآن کردن و ئازاردانی ئەوانی لەهاوەڵآنی خۆی گرت.

نامەی ئەسەد کوڕی جوندان بەدەستی محەممەد کوڕی عەبدوللە گەیشت و ئەوی لەجەنگی خۆی لەگەڵ عەلی کوڕی عەبدوللە ناسراو بەمەرعەشی و شکستی ئەو و هاوەڵآنی ئەو لەگەورەکانی کوێستان و گرتنی شاری ئامول ئاگادار کردەوە.

لەم ساڵەدا دوو پیاو لەئەرمەنستان شۆڕشیان کرد و عەلا کوڕی ئەحمەد

کارگوزاری بوغای شەرابی ڕووبەڕوویان بوویەوە و هەردووکیانی تێکشکاند. ئەو دوانە پەنایان بردە یەکێك لەقەلاّکانی نزیك خۆیان. عەلا گەمارۆی خستنە سەر و قەلاّکوتەکانی جێگیر کرد. ئەو دوانە هەلاّتن و خۆیان شاردەوە. عەلای نەیزانی بۆ کوێ ڕۆشتون و چییان بەسەر هاتووە بەلاّم دەستی بەسەر قەلاّکەدا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا عیسا کوڕی شێخ لەگەڵ موەفەقی خارجی جەنگی و شکستی پێهێنا و زیندانی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا نامەیەك لە محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە سەبارەت بەشۆڕشی یەکێك لەمناڵەکانی تالیب، لەڕەی گەیشت. بەپێی ئەم نامەیە ئەو سوپایەکی ئامادە کردووە و هێرشی کردۆتەسەر و شکستی پێ هێناوە. ناوی ئەم پیاوە، محەممەد کوڕی جەعفەر بوو. محەممەد کوڕی تاهیر ئەسیری کرد و دوای ئەسیر کردنی محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی حسەین کوڕی سەغیر کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕێگەی ڕەی گرتەبەر. ئیدریس کوڕی موسا کوڕی عەبدوللە کوڕی موسا کوڕی عەبدوللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاوڕێیەتی محەممەد کوڕی جەعفەری دەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەید لەجەنگ لەگەڵ محەممەد کوڕی تاهیر شکستی خوارد و هەلاّت. حەسەن کوڕی زەید لەگەڵ سی هەزار کەس هێرشی کردبووە سەر محەممەد. لەم ناوەدا سێسەد و چل کەس لەگەورەکانی حەسەن کوژران.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی یوسفی عەلەوی، خوشکەزای موسا کوڕی عەبدوللەی حەسەنی، شۆڕشی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەنێوان محەممەد کوڕی خالید کوڕی یەزید و ئەحمەد ئەلمولەد و ئەیوب کوڕی ئەحمەد لەسەکیر لەسەرزەمینی مناڵەکانی تەغلەب جەنگ هاتە ئاراوە. ژمارەیەکی فراوان لەهەر دوولا کوژران و سەرئەنجام، محەممەد شکستی خوارد و سامانەکەی تالاّن کرا.

لەم ساڵەدا بلکاجور ڕووی کردە ڕێگەی ڕۆم و دەستی بەسەر مەزمورەدا گرت و

تالأنی فراوانی کۆکردەوە و ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکانی ئەسیر کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەکوفە پیاوێك لەتالبییەکان بەناوی حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی حەمزە کوڕی عەبدوللە کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب قوت بوویەوە (دەبێت عەبدوللە کوڕی حەسەن بێت چوونکە حسەین جگە لەعەلی سەجاد منالّی دیکەی نەبوو). ئەو، محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی حەسەن کوڕی جەعفەر کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالبی بەنازناوی باوکی ئەحمەد وەك جێگری خۆی دیاریکرد. موستەعین، موزاحیم کوڕی خاقانی بۆ لای ئەو نارد. ئەم پیاوە کەقووت بوویەوە، لەدەوروبەری کوفە لەنێوان منالّەکانی ئەسەد و زەیدییەکان دەژیا. ئەو، ئەحمەد کوڕی نەسیر کوڕی حەمزە کوڕی مالکی خوزاعی کارگوزاری خەلیفەی بۆ کۆشکی هوبەیرە دوور خستەوە. دواتر موزاحیم کوڕی خاقان و هوشام کوڕی باوکی دولفی عیجلی یەکیان گرت. موزاحیم بەرەو کوفە بەرێکەوت. ئەو پیاوە عەلەوییە، دانیشتوانی کوفەی بۆ جەنگی ئەو دوانە هاندا و مژدەی سەرکەوتنی پێدان. موزاحیم هەنگاوی بردە پێش و مەبەستی دەستپێکردنی جەنگی کرد. ئەو پێشتر یەکێك لەفەرماندەکانی لەگەلّ دەستەیەکدا ڕەوانە کردبوو. ئەوان لەپشتەوە هێرشیان کردە سەر خەلّکانی کوفە و لەنێوان دوو سوپا گەمارۆیاندان بەشێوەیەك کەس نەیتوانی هەلّبێت. دواتر موزاحیم ڕۆشتە ناو شارەکە و خەلّکانی کوفە بەردبارانیان کرد. موزاحیم کوفەی کردە خۆراکی ئاگر. حەوت بازاری ئەم شارە لەئاگردا سووتا و ئاگر گەیشتە گەڕەکی سەبیع. دواتر هێرشی کردە سەر ئەو مالّەی پیاوی عەلەوی لەویّ بوو. بەلاّم ئەو هەلاّت و موزاحیم لەکوفە مایەوە تا ئەوەی موعتەز لەنامەیەك ئەوی بانگ کردەوە.

لەم ساڵەدا پیاوێکی عەلەوی لەکەنارەکانی نەینەوا لەسەرزەمینی عێراق ئالاّی شۆڕشی بەرز کردەوە و هوشام کوڕی باوکی دولف لەمانگی ڕەمەزان/ سێپتامبەر ڕووبەرووی بوویەوە. ژمارەیەك لەشوێنکەوتەکانی پیاوی عەلەوی کوژران. ئەو خۆی هەلاّت و ڕۆشتە ناو کوفە.

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل، ئەرقەت کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی ناسراو

بەکورکی، لەکەنارەکانی قەزوێن و زەنجان شۆڕشی کرد و کارگوزاری تاهیری لەو ناوچەیە دەرکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا منالەکانی عوقەیل ڕێگەی جەدەییان بڕی. جەعفەر لەشاشات جەنگی لەگەڵ کردن. لەم جەنگەدا سێسەد کەس لەدانیشتوانی مەککە کوژران و نرخی شتومەکەکان بەرز بوویەوە و عەرەبە سارانشینەکان لەگوندەکاندا تالآن کردنیان کردە پیشە.

هەروەها لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی یوسف کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوللە کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەککە شۆڕشی کرد. جەعفەر بۆ شاشات هەڵات. ئیسماعیل ماڵی و هاوەڵانی تالآن کرد و خوێنی ژمارەیەك لەسەربازەکان و دانیشتوانی مەککەی ڕشت. ئەو، هەموو ئەو سامانەی بۆ نۆژەن کردنەوەی ئارامگای پێغەمبەر(د.خ)، کۆکرابوویەوە، تالآنی کرد تەنانەت زێر و سیم و پەردەی کەعبەی لەگەڵ خۆی برد و نزیکەی دووسەد هەزار دیناری لەخەڵك سەند و دوای تالآن کردن، لەمەککە ڕۆشت و لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ ئاوریل دوای پەنجا ڕۆژ مانەوە، بەشێك لەشارەکەی سوتاند و دواتر ڕووی کردە مەدینە. فەرمانڕەوای مەدینە هەڵات و خۆی شاردەوە. ئیسماعیل لەمانگی ڕەجەب/ جولای بۆ مەککە گەڕایەوە و گەمارۆی خستە سەر دانیشتوانی شارەکە بەشێوەیەك خەڵکان لەبرسیەتی و تینویەتی دەمردن بەهای سێ ئەوقیە[٢٦] نان بۆ یەك درهەم و یەك ڕەتڵ[٢٧] گۆشت بۆ چوار درهەم و قومێك ئاو بۆ سێ دەرهەم بەرز بوویەوە. خەڵکانی مەککە لەم ڕۆژگارەدا گرفتاری ڕەنجێکی گیانبڕ بوون.

ئیسماعیل دوای پەنجا و حەوت ڕۆژ مانەوە، ڕێگەی جەدەی گرتەبەر. ئەو نەیهێشت خواردن بەخەڵکان بگات و سامانی بازرگانەکان و چۆیارەکانی بەزۆر سەند. دواتر ڕووی کردە عەرەفە. محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی مەنسور بەنازناوی کەعب ئەلبەقەر و عیسا کوڕی محەممەدی مەخزومی سوپاسالاری مەککە لەلایەن موعتەزەوە بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرا بوون.

---

[٢٦] ئەوقیە بەرابەرە لەگەڵ حەوت مسقاڵ

[٢٧] ڕەتڵ بەرابەرە لەگەڵ هەشتا و چوار مسقاڵ

ئیسماعیل ڕووبەڕووی ئەم دوانە بوویەوە و نزیکەی هەزار و پێنسەد کەس لەحاجییەکان کوژران و سامانی خەڵك تالآن کرا و بێ ئەوەی شەو و ڕۆژێك لەعەرەفە بمێننەوە، بۆ ناو شاری مەککە هەلأتن بەلأم ئیسماعیل و شوێنکەوتەکانی مانەوە. دواتر ئیسماعیل ڕێگەی جودەی گرتەبەر و ئەو ناوچەیشی تالآن کرد.

لەم ساڵەدا سەری سوقەتی خۆپارێز مرد. هەروەها ئیسحاق کوڕی مەنسور کوڕی بەهرام باوکی یەعقوبی کوشەج، حافزی نەیشابوری لەجومادی الاوەل/ مەی، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و دووی کۆچی( ٨٦٦ زایینی )

## چۆنیەتی لابردنی موستەعین

لەم ساڵەدا موستەعین ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موعتەسەمی لەخەلافەت لابرد و خەلافەتی بەموعتەزبالله کوڕی متوەکیل سپارد و لەهەینی چواری مورحەڕەم/ بیست و شەشی ژانویە موعتەز لەبەغداد وتارێکی خوێندەوە و بەیعەت لەهەموو سوپاییەکان وەرگیرا.

کوڕی تاهیر هاورێ لەگەڵ سەعید کوڕی حومەید هاتە لای موستەعین. ئەو مەرجەکانی ئەمان نامەی نووسیبوو، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! سەعید مەرجەکانی نووسیوە و تۆ دەبێت بەواژۆی خۆت پشتراستی بکەیتەوە، هەنووکە دەیخوێنینەوە و گوێی لێ بگرە.

موستەعین وتی: پێویست بەپشتراست کردنەوە ناکات، ئەم دەستەیە (هاوەڵانی موعتەز) باشتر لەتۆ خوا دەناسن، خۆت پێشتر پشتراستت کردۆتەوە و ئەوە نووسراوە کەتۆ دەیزانی. محەممەد کوڕی عەبدولله وەڵامی نەدایەوە.

کاتێك موستەعین بەیعەتی لەگەڵ موعتەز کرد و چەندین کەس شایەتی ئەم بەیعەتە بوون، لەگەڵ ژن و منالْ و هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لەروسافەوە بەرەو کۆشکی حەسەن کوڕی سەهل بەرێکەوتن و پاسەوانیان بۆ دانان. جل و بەرگ و داردەست و ئەنگوستیلەی خەلافەتی لێ سەندرایەوە. عەبدولله کوڕی تاهیر ئەرکی پاسەوانی کردنی ئەوی گرتە ئەستۆ. ڕێگەی ڕۆشتن بۆ حەجیان لێگرت. بەسرەی بۆ شوێنی مانەوەی خۆی هەڵبژارد. پێیان وت: کەش و هەوای بەسرە ناسازگارە و شوێنی نەخۆشییەکان و پەتایە. لەوەڵامدا وتی: ئایا نەخۆشی ئێرە کوشەندەترە یا دەست کێشانەوە لەخەلافەت.

لەشەشەی موحەرەم/ بیست و هەشتی ژانویە، زیاتر لەدوو کەشتی کەهەڵگری کالاْ جۆراوجۆرەکان و مەڕ و خواردەمەنی بوو، گەیشتە شاری بەغداد.

لەم ساڵەدا موستەعینیان بۆ واست ڕەوانە کرد و موعتەز، ئەحمەد کوڕی باوکی ئیسرائیلی وەك وەزیر هەڵبژارد و خەلاْتی پێ بەخشی. باوکی ئەحمەد لەدوانزەی

موحەڕەم/ چواری فەوریە بۆ سامەرا گەڕایەوە.

یەکێك لەشاعیرەکان سەبارەت بەلابردنی موستەعین ئەم هۆنراوەی هۆنیوەتەوە:

خلح الخليفة احمد بن محمد      و سيقتل التالى له او يخلع

و يزول ملك بنى ابيه و لا يرى      احد تملك منهم يستمتع

ايها بنى العباس ان سبيلكم      فى قتل اعبدكم سبيل مهيع

رقعتم دنياكم فتمزقت      بكم الحياة تمزقا لا يرقع

واتاکەی: ئەحمەد کوڕی محەممەد لەخەلافەت دوور خرایەوە، بەم زووانە جێگرەکەی ئەو لەسەر کار لادەبرێت یا دەکوژرێت. ئەی مناڵەکانی عەباس! رێگەی ئێوە بۆ کوشتنی بەندەکانی خۆتان رێگەیەکی هەموارە (لەکوشتنی ئەوان زێدەڕۆیی مەکەن) جیهانی خۆتان پینە و پەڕۆ کردووە (مەبەست لەوەیە بەزۆر دەسەڵاتتان لەدەستی خۆتاندا هێشتۆتەوە)، دڕاوییەکانتان دوورییەوە بەلأم ئەم جیهانە بەشێوەیەك لەیەك هەڵوەشاوە چیتر شیاوی دوورینەوە نییە.

سەبارت بە لەسەر کار لابردنی موستەعین شاعیرانی وەك بەحتەری و محەممەد کوڕی مەروان و کەسانی دیکە، هۆنراوەی زۆریان هۆنییەوەو.

لەبیست و سێی موحەڕەم/ پانزەی فەوریە دیوداد کوڕی دیودەست(لەسەردارە ئێرانییەکان) هاتە بەغداد و محەممەد کوڕی عەبدوللە جڵەوی کاروباری ئاویاری فوراتی پێسپارد. ئەویش دەستەیەکی بۆ دوور کردنەوەی تورك و مەغربییەکان لەدەوروبەری فورات ڕەوانە کرد. دواتر باوکی ساج رێگەی کوفەی گرتەبەر.

## بەسەرهاتی وەسیف و بوغا

لەم ساڵەدا موعتەز فەرمانی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە نووسی تا ناوی وەسیف و بوغا لەدیوان بسڕنەوە.

محەممەد کوڕی باوکی عەون یەکێك لەسەردارەکانی محەممەد کوڕی عەبدوللە بوو. بەڵێنی بەباوکی ئەحمەد (برای موعتەز و فەرماندەی گشتی) دابوو بوغا و وەسیف بکوژێت. موعتەزیش وەك پاداشت محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی وەك ئەمیری یەمامە و بەحرەین و بەسرە دەستنیشان کرد. دەستەیەك لەهاوەڵانی بوغا و

وەسیف لەم مەبەستە ئاگاداریان کردنەوە و ئەوان هەڕەشەیان لە محەممەد کوڕی عەبدوللە کرد. ئەو دوانە ڕۆشتنە لای محەممەد و ئەویان لەمەبەستی باوکی عەون بۆ کوشتنیان، ئاگادار کردەوە. بوغا وتی: ئەم دەستەیە (موعتەز و شوێنکەوتەکانی) فێڵیان لەئێمە کرد و لەپەیمانەکەیان لەگەڵ ئێمە ڕێگەی ناسازگارییان گرتۆتەبەر. سوێند بەخوا ئەگەر مەبەستی کوشتنی ئێمەیان هەبێت، هیچ کات پێی ناگەن. وەسیف قسەکەی بڕی و وتی: ئێمە دەست رادەگرین و لەماڵەکانی خۆمان دەمێنینەوە و چاوەڕوانی هاتنی کەسێك دەبین کەمەبەستی کوشتنی ئێمەی هەبێت. ئەو دوانە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان و سوپایەکیان ئامادە کرد.

وەسیف خوشکەکەی، سوعادی کەدایەنی مۆئەییەد بوو بۆ تکاکاری ناردە لای مۆئەییەد. مۆئەییەد لەگەڵ موعتەز قسەی کرد تا لەو دوانە خۆش بێت. موعتەز لەوەسیف خۆش بوو و لەنامەیەکدا بۆی نووسی. باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل سەبارەت بەبوغا قسەی لەگەڵ موعتەز کرد. موعتەز نامەی بەخشینی بۆ بوغا نووسی. ئەو دوانە لەبەغداد بوون. تورکان لای موعتەز پێداگرییان کرد تا وەسیف و بوغا بۆ سامەرا بانگ بکات. ئەو ئەم داواکارییەی بۆ وەسیف و بوغا نووسی بەڵام لەلایەکی دیکە نامەی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە نووسی ڕێگەی ئەو کارەیان لێ بگرێت (هاتن بۆ سامەرا). ئەوان نامەکەیان بۆ لای محەممەد کوڕی عەبدوللە نارد تا مۆڵەتی لێ وەربگرن. وەسیف و بوغا و نزیکەی چوارسەد کەس لەسوارەکان و منداڵەکانیان بەرێکەوتن و سامان و بنەماڵەکەیان لەناو ماڵەکاندا بەجێهێشت. کوڕی تاهیر کەسی نارد و لەدەروازەی شەماسییە ڕێگەی لێگرتن. ئەوان گەڕانەوە و لەدەروازەی خوراسانەوە ڕۆشتن و خۆیان گەیاندە سامەرا. کاتێك گەیشتنە سامەرا، ڕۆشتنە ماڵەکانی خۆیان. موعتەز هەردووکیانی خەڵات کرد و پێگەکانی پێشووی پێ بەخشینەوە. سەرپەرەستی بەریدی بەموسا کوڕی بوغای گەورە سپارد.

## ئاژاوە لەنێوان سوپاکەی بەغداد و محەممەد کوڕی عەبدوللە

لەم ساڵەدا لەنێوان سوپاکەی بەغداد و هاوەڵانی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر ئاژاوە روویدا.

هۆکاری ئەم ناسازگارییە ئەوە بوو کەنۆکەرەکان (شاکرییەکان) و سەربازە مووچە خۆرەکان لەمانگی رەمەزان/ سێپتامبەر و لەکۆشکی محەممەد کۆبوونەوە و داوای مانگانەی خۆیان کرد. محەممەد پێی وتن: نامەم بۆ سەروەری باوەڕداران نووسیوە تا مانگانەی ئێوە ڕەوانە بکات، ئەو لەوەڵامدا نووسیویەتی: ئەگەر سوپاکەت بۆ خۆت دەوێت، خۆت مانگانەی ئەوان دابین بکە، ئەگەر سوپات بۆ ئێمە دەوێت، ئێمە پێویستمان پێی نییە. ئەوان بەبیستنی ئەم وتەیە، هاتنە جۆش. محەممەد فەرمانیدا دوو هەزار دینار بێنن و لەناو ئەوان دابەشی بکەن و بەم شێوەیە هێور بوونەوە.

ئەم دەستەیە دووبارە لەمانگی رەمەزان/ سێپتامبەر کۆبوونەوە. ئاڵاکانیان هەڵکرد و تەپڵەکانیان هێنایە دەنگ و لەدەروازەی حەرب و شەماسییە و شوێنەکانی دیکە خێوەتیان هەڵدا و لەبوریا و حەسیر کوخیان دروست کرد. کاتێك شەویان بەسەر برد، بەرەبەیان ژمارەیان زیادی کرد. محەممەد هاوەڵانی بانگ کرد و شەویان لەماڵی ئەو بەسەر برد. ماڵەکەی لێوالێو بوو لەپیاوەکان و ژمارەیەکیش لەئاژاوەگێڕانی شار لەدەروازەی حەرب، لەگەڵ شۆڕشییەکان جەنگان و کەرەستەی جەنگ و تەپڵیان بۆ خۆیان بەدەست هێنا. باوکی قاسم عەبدونیان وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد. ئەو منالی موەفەق و لەراوێژکارانی عوبەیداللە کوڕی یەحیا کوڕی خاقان بوو. باوکی قاسم ئەم دەستەی ناچار کرد لەوەرگرتنی مانگانە خۆراگری و بوێری لەخۆیان نیشان بدەن.

لەرۆژی هەینی مەبەستی ئەوەیان کرد رێگە لەوتار خوێن بۆ ڕۆشتن بۆ مزگەوت و خوێندنەوەی وتار بەناوی موعتەز بگرن. وتارخوێن ئاگادار بوویەوە و بەبیانوی نەخۆشی، وتاری نەخوێندەوە.

شۆڕشییەکان مەبەستی پردەکەیان کرد. کوڕی تاهیر دەستەیەك لەسەردارەکانی خۆی لەگەڵ ژمارەیەك شاسوار و پیادە بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کردو

لەنێوان ئەم دوو سوپایە ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و ژمارەیەك کوژران و کەوتنە سەرزەوی. هاوەڵانی تاهیر لەپردەکە پاشەکشێیان کرد. شۆڕشییەکانی بەشی رۆژهەڵات کاتێك بینیان، هاورێکانیان، هاوەڵانی تاهیریان لەپردەکە دوور خستۆتەوە، هێرشیان هێنا تاپەیوەستی هاورێکانیان بن.

کوڕی تاهیر چەند کەشتی لەچیلکە و قامیش و خۆڵ و خاشاك پڕ کرد. کەشتییەکانی گڕ تێبەردا و بەرەو لای پردەکە ڕەوانەی کردن. کەشتییەکان پردەکەیان سووتاند و بەرەو لای پردەکانی دیکە درێژەیان بەرێگەکەیاندا بەڵام سەربازەکانی بەشی رۆژئاوا خۆیان پێگەیاند و نغرۆیان کردن. پاشەکشێیان بەسوپاکەی تاهیر کرد تا بەردەم ماڵەکەی. لەم ناوەدا دە کەس کوژران. خەڵکان بنکەی شورتە (ئاسایشی) شاریان تاڵان کرد و کاڵا جۆراوجۆرەکانیان فڕاند.

کاتێك کوڕی تاهیر بینی سوپای دوژمن هێرشی کردۆتە سەر هاوەڵانی، فەرمانیدا دوکانەکانی کەنار پردەکە بسوتێنن و بەمشێوەیە بڕێکی زۆر کاڵای بازرگانان سووتێنرا. ئاگر دوو سوپاکەی لەیەك جیا کردەوە و شۆڕشییەکان بۆ ئوردووگای خۆیان لەدەروازەی حەرب گەڕانەوە. کوڕی تاهیر سوپاکەی کۆکردەوە و لەترسی گەڕانەوەی شۆڕشییەکان ئەوانی ئامادە کرد بەڵام ئەوان چیتر نەگەڕانەوە.

لەیەکێك لەرۆژەکان دوو پیاو لەشۆڕشییەکان هاتنە لای تاهیر و چۆنیەتی شکست پێهێنانی شۆڕشییەکان و کپ کردنی ئەم ئاژاوەیان پێ نیشاندا. کوڕی تاهیر فەرمانیدا دووسەد دیناریان وەك پاداشت پێ بدەن. فەرمانی بەشا کوڕی میکال و سەردارەکانی دیکەدا بەرەو ئەوێ بەرێکەون. ئەوان روویان کردە ئەو کەنارە. باوکی قاسم، فەرماندەی شۆڕشییەکان و کوڕی خەلیل و سەرکردەکانی دیکەی ئەوان، لەهاتنی شا کوڕی میکال ترسان. هێزەکانی ئەم دوو شۆڕشییە بڵاوەیان لێکردبوو و بەم شێوەیە هەرکام بەرەو شوێنی خۆیان گەڕانەوە. کوڕی خەلیل رووبەرووی شا کوڕی میکال و سوپاکەی بوویەوە و دەنگی بەرز کردەوە، هاوەڵانی محەممەدیش دەنگیان بەرز کردەوە و ئەو لەناو ئەوان گرفتار بوو وکوژراو وکەوتە سەرزەوی. باوکی قاسم خۆی حەشاردا، بەڵام شوێنەکەیان دۆزییەوە و

گرتیان و بردیانە لای کوڕی تاهیر. سوپاکەی ئەو لەدەروازەی حەرب بڵاوەی لێکرد و هەرکەس بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە. باوکی قاسمیان گرت و بەرادەیەك ئەشکەنجەیان کرد تا گیانیدا. ئەم ڕووداوە لەمانگی رەمەزان، سێپتامبەر ڕوویدا.

## چۆنیەتی لابردنی مۆئەییەد و مەرگی ئەو

لەمانگی رەجەب/ ژوئییە، موعتەز مۆئەییەدی برای لەجێگری خۆی دوورخستەوە. چۆنیەتی ئەم کارە بەم شێوە بوو: عەلا کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای ئەرمەنستان، پێنج هەزار دیناری بۆ مۆئەییەد نارد تا بارودۆخی خۆی سامان بیەخشێت. عیسا کوڕی فەرخان ئاگادار بوویەوە و پارەکەی فڕاند. مۆئەییەد، تورکەکانی دژی عیسا کوڕی فەرخان هاندا بەڵام نەیتوانی مەغرىبییەکان بۆ ئەو کارە ناچار بکات. موعتەز ئەمەی بیست. کەسی بەدوای مۆئەییەد و باوکی ئەحمەدی برای نارد. هەردووکیانی گرت و زیندانی کردن. مۆئەییەدی قۆڵبەست کرد و پاداشتی بەتورك و مەغرىبییەکاندا.

دەگێڕنەوە کەموعتەز، چل قامچی لەمۆئەییەددا و ئەوی لەسامەرا، لەجێگری خۆی دوور خستەوە و بۆ ئەم کارە لەمۆئەییەد دەستنوسێکی بەخەتی خۆی وەرگرت. مەرگی مۆئەییەد لەبیست و دووەمی رەجەب/ سی ژوئییە ڕوویدا.

چۆنیەتی مەرگی بەم شێوە بوو: ژنێك لەژنەکانی تورك، محەممەد کوڕی راشدی ئاگادار کردەوە کەتورکەکان مەبەستی ئازاد کردنی مۆئەییەدیان لەزیندان هەیە. ئەو موعتەزی لەم هەواڵە ئاگادار کردەوە بەڵام موسا کوڕی بوغا وتی: تورکەکان دەخوازن باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل ئازاد بکەن چوونکە لەگەڵ ئەو هاودەمن و لەجەنگدا لەگەڵ ئەو بوون. بۆ بەیانی، موعتەز، قازی و فەقیە و گەورەکانی بانگ کرد و جەستەی بێ گیانی مۆئەییەد بێ ئەوەی شوێنی هیچ برین یا ئەشکەنجە و قامچی بەسەر جەستەیەوە بێت، لەزیندان هێنایانەدەر و تەسلیم بەدایکیان کرد. کفنیان لای جەنازەکەی دانا و دایکی بەخاکی سپارد. دەڵێن: ئەویان لەپۆششێك لەپێستی سمۆرە پێچاوە و هەردوو لایان بەرادەیەك گوشی تا گیانی دەرچوو. هەروەها دەڵێن: ئەویان لەناو سەهۆڵدا دانیشاند و بەفریان کرد بەسەریا و بەهۆی

سەرماوە، ڕەقی بردەوە. کاتێك مۆئەییەد مرد، براکەی باوکی ئەحمەد زیندانی کرد. ئەو برای مۆئەییەد بوو (لەدایك و باوکەوە).

## چۆنیەتی کوژرانی موستەعین

کاتێك موعتەز مەبەستی ئەوەی کرد موستەعین ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موعتەسەم بکوژێت، فەرمانێکی بۆ محەممەد کوڕی عەبدوللە نووسی و فەرمانیْ پێدا موستەعین بەسیمای خزمەتکار بسپێرێت. محەممەد کوڕی عەبدوللە ئەم کارەی خستە ئەستۆی ئەحمەد کوڕی تولون. ئەحمەد ئەوی گرت و لەگەڵ ئەو ڕێگەی قاتولی بڕی و تەسلیم بەسەعید کوڕی ساڵحی سپارد. سەعید ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی و قامچی بارانی کرد تا گیانی دەرچوو.

هەروەها دەڵێن بەردێکیان بەقاچییەوە بەستەوە و فڕیاندایە ناو دیجلە. هەروەها دەڵێن ئەو دایەنەکەیان لەدوو لای کەژاوە بەستەوە. کاتێك سەعید لێی نزیك بوویەوە، بەشمشێر لێیدا. موستەعین هاواری کرد وەك دایەنەکەی. بەم شێوەیە هەردووکیان کوژران.

موعتەز کاتێك یاری شەترەنجی دەکرد، سەری موستەعینیان بردە لای. وتیان: ئەمە سەری خەلیفەی لەسەر کار لابراوە. موعتەز وتی: لەسوچێکدا دایبنێت تا ئەم یارییە تەواو دەبێت. کاتێك کۆتایی بەیارییەکە هێنا، سەیری کرد و فەرمانیدا بەخاکی بسپێرن و وتی پەنجا هەزار درهەم بەسەعید بدەن و وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشانی بکەن.

## ئاژاوەی نێوان تورکەکان و مەغربییەکان

لەسەرەتای ڕەجەبی ئەم ساڵە/ هەژدەی ژوئیە، لەنێوان تورکەکان و مەغربییەکان ئاژاوە کەوتەوە. هۆکاری ئەم شۆڕشە ئەوە بوو تورکەکان هێرشیان کردە سەر عیسا کوڕی فەرخان شا و لێیاندا و ئەسپەکەیان لیْ سەند. مەغربییەکان بەسەرکردایەتی محەممەد کوڕی ڕاشید و نەسر کوڕی سەعد کۆبوونەوە و هێرشیان کردە سەر تورکەکان. کۆشکیان لەدەستی تورکەکان دەرهێنا و ئەوانیان لەویْ دوور

خستەوە و پێیان وتن: هەر رۆژ خەلیفەیەك دەکوژن یا لەخەلافەت دووری دەخەنەوە و کەسێکی دیکە وەك وەزیر هەڵدەبژێرن.

کۆشك و گەنجینەکان کەوتە دەستی مەغریبییەکان. ئەو چوارپێیانەیان هەڵگرت کەتورکەکان بەجێیان هێشتبوو. تورکەکان کۆبوونەوە و کەسیان بەدوای تورکانی کەرخ و شوێنەکانی دیکە نارد. هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە و رووبەرووی مەغریبییەکان بوونەوە. ئاژاوەگێرانی شار و نۆکەرەکان، هاوکاری مەغریبییەکانیان دەکرد. تورکان ناتەوان و بەناچاری ملکەچی خۆیان دەربڕی.

جەعفەر کوڕی عەبدواحید لەنێوان ئەوان ئاشتی سەقامگیر کرد بەو مەرجەی کارەسات نەخولقێنن و لە هەر شوێنێك یەکێك لەتورکەکان بۆکارێك راسپێردرێت، لەمەغریبییەکانیش کەسێك هاورێیەتی بکات و بەپێچەوانەوە و کەس بەتەنیا بۆ راپەراندنی کاروبارەکان رانەسپێردرێت. ئەوان بۆ ماوەیەك بەم شێوەیە مانەوە. دواتر دووبارە تورکەکان کۆبوونەوە و وتیان: ئێمە سەری ئەم دوانە (محەممەد کوڕی راشید و نەسر کوڕی سەعدمان) دەوێت. ئەگەر ئەوان لەناو ببەین، چیتر کەس ناتەوانێت قسە بکات. محەممەد کوڕی راشید و نەسر کوڕی سەعد لەمەبەستی تورکەکان ئاگادار بوونەوە. ئەو دوانە ویستیان بەرەو ماڵی محەممەد کوڕی غەرون بڕۆن و تا دامرکاندنەوەی رقی تورکەکان لای ئەو بمێننەوە و دواتر بگەڕێنەوە. محەممەد کوڕی غەروان تورکەکانی لەبوونی ئەوان ئاگادار کردەوە. تورکەکان ئەو دوانەیان گرت و سەریان بڕین. موعتەز لەمە ئاگادار بوویەوە و مەبەستی کوشتی کوڕی غەرونی کرد. دەستەیەك نێوەنجیگەرییان کرد و موعتەز ئەوی بۆ بەغداد دوور خستەوە.

## شۆڕشی موساور لەبوازیج

لەرەجەب/ ژوئیەی ئەم ساڵە موساور کوڕی عەبدحەمید کوڕی موساوری شاری (شاری بەمانای کڕیار دێت کە لەقورئاندا ئاماژەی پێدراوە و هەرکەس لەرێگەی خواوەند شۆڕش بکات، نەفسی خۆی دەکرێتەوە. خەوارجیان بەشاری ناو دەبرد)بوجَلی موسڵی لەبوازیج شۆڕشی کرد. باوەگەورێی ئەو موساور لەموسڵ خاوەنی میوانخانەی موساور بوو و میوانخانەی موساور لەموسڵ بەناوی

باوەگەورێی ئەوە.

هۆکاری شۆڕشەکەی ئەوە بوو ئاسایشی(شورتە) موسڵ کە لەژێر فەرمانی منداڵەکانی عیمران و سەرکردەکانی دیکە بوون، پیاوێك بەناوی حسەین کوڕی بوکەیریان بۆ پاسەوانی راسپارد. ئەو منالّی موساوری بەناوی حەوسەرە گرت و لەحەدیسییە زیندانی کرد. حەوسەرە گەنجێکی جوان بوو. حسەین شەوانە ئەوی لەزیندان دەهێنایەدەر و لەگەڵی رایدەبوارد و بەرۆژ دەیگەڕاندەوە بۆ زیندان. حەوسەرە باوکی لەم کارە ئاگادار کردەوە کە لەبوازیچ بوو. بۆی نووسی: رۆژ لەزیندان و شەو لەباوەشیّ ناپیاوەکان بەسەر دەبەم. باوکی لەم وتەیە بەرادەیەك تورە بوو کەئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستەیەك پەیوەستی بوون و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەو مەبەستی حەدیسیەی کرد. حسەین کوڕی بوکەیر خۆی شاردەوە و موساور کوڕەکەی لەزیندان هێنایەدەر. ژمارەی هاوەڵە کورد و عەرەبەکانی زیادیان کرد. موساور بەرەو موسڵ بەرێکەوت و لەبەشی رۆژهەلأت دابەزی. فەرمانڕەوای موسڵ، عوقبە کوڕی محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس کوڕی ئەهبانی خوزاعی بوو. دەیانوت ئەهبان لەگەڵ گورگ قسەی کردووە و هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ) بووە. عوقبە لەلای رۆژهەلأتەوە دوو پیاوی نارد تا رووبەڕووی موساور ببنەوە. ئەوان لەدیجلە پەڕینەوە و خۆیان بەموساور گەیاند و شەڕیان دەستپێکرد بەلأم هەردووکیان کوژران و موساور گەڕایەوە و چیتر جەنگ کردنی بەرەوا نەزانی. حەوسرە کوڕی موساور هاورێیەتی باوکی دەکرد. ئەم هۆنراوەی لەباوکی بیست:

انا الغلام البجلی الشاری اخرجنی جورکم من داری

واتاکەی: منم ئەو مێردمنداڵە بجلییە کەکڕیاری نەفسی خۆی بۆ جیهادە و ستەمی ئێوە منی لەماڵەکەم هێنایەدەر.

**بیرکردنەوەی چەند رووداوێك**

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی کوڕی خەلەف عەتار ودەستەیەك لەتالبییەکان (منالّەکانی ئەبی تالیب) وەك باوکی ئەحمەد محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی حەسەن کوڕی جەعفەر کوڕی حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

و باوکی هاشم داود کوڕی قاسمی جەعفەری لەمانگی شەعبان/ ئۆگۆست بۆ سامەرا بران.

چۆنیەتی ئەم ڕووداوە بەم شێوە بوو: پیاوێك لەتالیبییەکان لەگەڵ دەستەیەك لەنۆکەران لەبەغداد بەرەو کوفە بەڕێکەوت. لەو ڕۆژگارەدا کوفە لەسنوری دەسەڵاتی باوکی ساجدا بوو و خۆی لەبەغداد ژیانی بەسەر دەبرد. محەممەد کوڕی عەبدوللە فەرمانی پێدا بەرەو کوفە بڕوات و ئەو پێش خۆی جێگرەکەی، عەبدولرەحمانی بۆ کوفە نارد. کاتێك عەبدولرەحمان گەیشتە کوفە، دانیشتووانی ئەم شارە بەگومانی ئەوەی بۆ جەنگی پیاوی عەلەوی هاتووە، بەردبارانیان کرد. عەبدولرەحمان کاتێك ئەمەی بینی وتی: من کارگوزاری ئەم شارە نیم، تەنیا سەربازێکم کەبۆ جەنگ لەگەڵ سارانشینەکان هاتووم. دەستیان لێ هەڵگرت.

موعتەز باوکی ئەحمەدی تالبی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کردبوو. ئەمە دوای ئەوە بوو کەموزاحیم کوڕی خاقان ئەو پیاوە عەلەوییەی لەکوفە شکستدا و پێشتر ئاماژەمان پێدا. باوکی ئەحمەد لەکوفە خراپەکاری کردە پیشە و خەڵکانی ڕەنجاند و دەستی بەسەر سامان و زەوییەکانی ئەواندا گرت. کاتێك عەبدولرەحمان لەکوفە مایەوە، ڕێگەی سازان و خۆشەویستی لەگەڵ گرتەبەر تا ئەو جێگەی باوکی ئەحمەد تێکەڵی بوو و لەسەر سفرەکەی دانیشت. دواتر لەگەڵ ئەو بۆ گەڕان ڕۆشتە یەکێك لەباغەکانی کوفە. عەبدولرەحمان پێشتر هاوەڵانی خۆی ئامادە کردبوو. کاتێك شەو داهات ئەوی ئەسیر کرد و لەرەبیع الاخر/ ئاوریل ڕەوانەی بەغدادی کرد. لەناو کەل و پەلەکانی برازاکەی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی خەلەف کوڕی عەتار ( لەگەڵ ئەو گرفتار ببوو) چەندین نامە لەحەسەن کوڕی زەید دۆزرایەوە. موعتەزیان لەمە ئاگادار کردەوە و ئەو، فەرمانی بە محەممەد کوڕی عەبدوللەدا ئەو و تالبییەکانی دیکە بباتە سامەرا. بەم شێوەیە هەموویان ڕەوانەی سامەرا کران.

لەم ساڵەدا حسیەن کوڕی باوکی شەوارب، وەك قازی قازییەکان دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا باوکی ساج بەفەرمانی محەممەد کوڕی عەلی پاسەوانی کردنی ڕێگەی خوراسانی گرتەئەستۆ.

هەروەها لەم ساڵەدا عیسا کوڕی شێخ وەك فەرمانڕەوایی ڕەملە ڕاسپێردرا. ئەو

جێگرەکەی خۆی، باوکی موغرای بۆ ئەو ناوچەیە نارد. کوڕی عیسا، شەیبانی و منداڵەکەی شێخ کوڕی سەلیل لەمنداڵەکانی جەساس کوڕی موڕە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان بوو کەدەسەڵاتی بەسەر هەموو فەلەستیندا گرت. کاتێك تورکەکان لەعێراق شۆڕشیان کرد، ئەو فەرمانڕەوایەتی دیمەشق ودەوروبەری گرتە دەست و یاخی بوو، خەراجی نەدا و ئەوەی لەشامەوە بۆ خەلیفە ڕەوانە دەکرا، دەستی بەسەردا گرت و تایبەتی کرد بەخۆی.

لەم ساڵەدا وەسیف فەرمانی بۆ عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف نووسی و کێوەکان (کوێستان: لوڕستان و کوردستانی) خستە ژێر فەرمانی ئەو، خەڵاتی بۆ نارد. عەبدولعەزیز ئەم کارەی بەفەرمانی وەسیف گرتە ئەستۆ.

لەم ساڵەدا جوستانی دەیلەمی لەگەڵ عیسا کوڕی ئەحمەدی عەلەوی و حسەین کوڕی ئەحمەدی کەوکەبی هێرشیان کردە سەر ڕەی، ژمارەیەکیان کوشت و ئەسیر کرد و تالآنییان کردە پیشە. فەرمانڕەوای ڕەی لەم ڕۆژگارەدا عەبدوللە کوڕی عوزەیز بوو کەهەڵات. دانیشتوان لەبەرابەر پێدانی هەزار هەزار درهەم پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەستن. ئەوان شارەکەیان بەجێهێشت بەڵام دواتر کوڕی عوزەیز گەڕایەوە و ئەحمەد کوڕی عیسای گرت و ڕەوانەی نەیشابوری کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی مەنسور ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولڕەحمان، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، سوپایەکی بۆ سەرزەمینی ناباوەڕان ڕەوانە کرد. ئەوان مەبەستی ئەلبە و شاری مانەیان کرد و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ئەو ناوچەیان کوشت و سوپاکە تەندروست گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی بەشاری بوندار و باوکی موسا محەممەد کوڕی موسەنای دەمن کەهەردووك خەڵکی بەسرە و لەمامۆستاکانی بوخاری و موسلیم لەنوسینی (صحیحی بوخاری و صحیحی موسلم لەحەدیس) بوون، مردن. ساڵی لەدایك بوونی بوندار ٧٨٣/١٦٧ زایینیە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و سێی کۆچی ( ٨٦٧ زایینی )

### چۆنیەتی لێسەندنی کەرەج لەباوکی دۆلف

لەرەجەب/ ژوئیەی ئەم ساڵە، موعتەز، فەرمانڕەوای کێوەکانی بەموسا کوڕی بوغای گەورە سپارد. ئەو موفلحی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. موفلیح لەدەرەوەی هەمەدان ڕووبەڕووی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف بوویەوە و شەڕیان دەستپێکرد. زیاتر لەبیست هەزار دز و ڕێگر هاورێیەتی عەبدولعەزیزیان دەکرد. عەبدولعەزیز شکستی خوارد وسوپاکەی کوشتار کران.

لەرەمەزان/ سێپتامبەر، موفلیح ڕووی کردە کەرەج و دوو سەنگەری لەوێ ئامادە کرد. عەبدولعەزیز سوپایەکی چوار هەزار کەسی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. موفلیح ڕووبەڕوویان بوویەوە وئەوانەی لەناو سەنگەرەکاندا بوون، هاتنەدەر و پاشەکشێیان پێکرد. ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ئەسیر کرد. عەبدولعەزیز بۆ هاوکاری سوپاکەی هات بەلاّم ئەویش بەهەلاّتنی سوپاکەی هەلاّت و لەکەرەج ڕۆشتەدەر. ڕۆشتە قەلاّیەك کە بەزۆر ناویان دەبرد. لەوێ پەنای گرت. موفلیح هاتە کەرەج و بنەماڵەی عەبدولعەزیزی ئەسیر کرد. دایکی عەبدولعەزیز لەناو ئەسیرەکان دەبینرا. (باوکی دۆلفی عیجیل کە عەبدولعەزیز منالّی ئەو بوو، یەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی شیعەیە. ئەبو موسلیمی خوراسانی موالی باوەگەورێکانی بنەماڵەی باوکی دۆلفە. کەرەج جیاوازە لەکەرەجی ئیستا. کەرەج** کۆڕ و هەنووکە ڕووباری کۆڕ لەدەوروبەری ئەراك بەناو بانگە.

### چۆنیەتی کوژرانی وەسیف

لەم ساڵەدا وەسیف کوژرا. هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بوو تورکەکان و فەرغانییەکان و ئەشروسنییەکان شۆڕشیان کرد و داوای مانگانەی چوارمانگیان کرد. بوغا و سیما و وەسیف ڕۆشتنە لایان. وەسیف گفتوگۆی لەگەلّ کردن و وتی: ئێمە سامانمان پێ نییە، ئەگەر دەخوازن قوڕ هەڵگرن وبیکەن بەسەری خۆتانا. بوغا وتی: با لەگەلّ سەروەری باوەڕداران قسە بکەین و لەکۆشکی ئەشناس لەو

بارە راوێژ دەکەین. ڕۆشتنە کۆشکی ئەشناس.

سیما و بوغا ڕۆشتنە بارەگای موعتەز و وەسیف لەناو ئەواندا مایەوە. یەکێك لەشۆڕشییەکان خۆی پێگەیاند و بەشمشێر لێیدا. یەکیتر چەقۆی لەسکی چەقاند و دواتر بەتەورزین لەت لەتیان کرد و کوشتیان. سەری وەسیفیان لێکردەوە و کردیان بەکۆلۆژەوە[٢٨]. موعتەز کار و پێگەی وەسیفی بەبوغای شەرابی یا هەمان بوغای بچوك سپارد و تاجێك و دوو بازووبەندی پێ بەخشی.

## کوژرانی بونداری تەبەری

لەم ساڵەدا بونداری تەبەرییان کوشت. چۆنیەتی کوشتنی ئەو بەمشێوەیە: موساور کوڕی عەبدحەمیدی موسڵی کاتێك لەبوازیج شۆڕشی کرد (وەك ئامارژەمان پێدا) و ڕێگەی خوراسان لەژێر دەستی بوندار و موزەفەر کوڕی سیسیل بوو. لەو کاتەدا هەردووکیان لەدەسکەرە بوون. بوندار ئاگادار بوویەوە کەموساور بەرەو کەرخی حەدان دەڕوا. موزەفەر داوای لەبوندار کرد شوێنپێی هەڵگرێت. بوندار بەموزەفەری وت: هەنووکە ڕۆژ بەسەرهاتووە و بەیانی جەژنە، کاتێك جەژنمان کرد، شوێنی دەکەوین. بوندار بەتەماحی ئەوەی ئەم سەرکەوتنە بەخۆی ببڕێت، شەوانە بەرێکەوت تا ئەو جێگەی بەسەر ئوردووگاکەی موساوری دەیڕوانی. دەستەیەك لەهاوەڵانی پێشنیاریان پێکرد شەو بەشێوەیەکی نهێنی بەسەر ببەن بەڵام بوندار رازی نەبوو و وتی: با بیانبینین و بمانبینن. شۆڕشییەکان لەبونی ئەو ئاگادار بوونەوە. سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون و جەنگیان دەستپێکرد.

سێسەد سوار لەگەڵ بوندار و ژمارەی شۆڕشییەکان حەوتسەد سوار بوو. شەڕێکی قورس لەنێوان ئەم دوو سوپایە دەستی پێکرد. شۆڕشییەکان هێرشیان برد و زیاتر لەسەد کەس لەسوپاکەی بوندار جیابوونەوە. هەرچەندە خۆڕاگرییان کرد بەڵام سەرئەنجام هەموویان کوژران و بوندار و سوپاکەی شکستیان خوارد. شۆڕشییەکان ئەوانیان لەیەك جیا دەکردەوە و دواتر خوێنیان دەڕشتن. بوندار هەڵات و شۆڕشییەکان شوێنیان کەوتن و خۆیان پێگەیاند. کوشتیان و سەریان

---

[٢٨] کۆلۆژ: دارێکە ئاگری ناو تەنوری پێ ئەمبارەو بار دەکەن. (وەرگێڕ)

بڕی و بەڕمەوە هەڵیانواسی. نزیکەی پەنجا کەس لەهاوەڵانی ڕزگاریان بوو و سەد کەسیان کوژران.

موزەفەر ئاگادار بوویەوە و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر. موساوریش ڕێگەی حولوانی گرتە بەر و خەڵکی ئەم شارە بەجەنگ ڕووبەڕووی بوونەوە. لەدانیشتوانی حولوان چوارسەد کەس کوژرا و ژمارەیەك لەهاوەڵانی موساوریش کوژران. ژمارەیەك لەحاجییەکانی خوراسان لەحولوانیش گیانیان لەدەستدا. ئەم حاجییانە لەسەرەتادا هاوکاری خەڵکی شارەکەیان دەکرد بەڵام چوونکە نەیانتوانی هیچ بکەن، ڕێگەی خۆیان گرتەبەر و ڕۆشتن.

منداڵەکەی موساور لەمبارەوە وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| فجعت العرقا ببندارها | و حزت البلاد باقطارها |
| و حلوان صبحتها غارة | فقتلت اغرار غرارها |
| و عقبة بالموصل احجرتة | و طوقته الذل فی کارها |

واتاکەی: عێراقم بەکوشتنی بوندار داغدار کرد و دەستم بەهەموو ناوچەکانی ئەو سەرزەمینە گەیشت. لەبەرەبەیانان حولوانم تاڵان کردو گەنجە لەخۆباییەکانیم کوشت و عوقەبەم لەموسڵ بەند کرد و تەوقی ڕیسواییم کردە ملی و گرفتاری ئەو کارەم کرد.

## چۆنیەتی مردنی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر

لەشەوی چواردەی زیحەججە/ شانزەی دێسامبەر مانگ بەتەواوی گیرا و بەنەمانی ئەم مانگ گیرانە، محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر مرد. دەستەیەك مەرگی ئەو بەهۆی ئەو برینانەوە دەزانن کە لەقوڕگ و سەری هات و سەرئەنجام کوشتی. بۆ دەرمانی ئەم برینانە پلیتەیان تێدەکرد.

کاتێك نەخۆشییەکەی پەرەی سەند، نامەی بۆ کارگوزار و ڕاوێژکارەکانی نووسی و هەموو کارەکانی خۆی بەبراکەی، عوبەیداللە کوڕی تاهیر سپارد و کاتێك مرد، لەنێوان کوڕەکەی تاهیر و عوبەیداللەی برای لەسەر نوێژ خوێندن لەسەر جەنازەکەی ئاژاوە کەوتەوە و سەرئەنجام کوڕەکەی نوێژی لەسەر جەنازەکەی

خوێند. هاوەڵانی تاهیر لەگەڵ عوبەیداللە ناسازگار بوون تا ئەوەی شمشێریان دەرکێشا و یەکتریان بەردباران کرد. هەموان خوازیاری شوێنکەوتنی تاهیر بوون. عوبەیداللە لەرووباری دیجلە پەڕییەوە و بەرەو ماڵەکەی لەبەشی ڕۆژهەڵات بەڕێکەوت. سەرکردەکانی سوپا پەیوەستی بوون چوونکە محەممەد لەوەسیەت نامەکەی جڵەوی هەموو کارەکانی بەو سپاردبوو.

موعتەز خەڵاتی بۆ عوبەیداللە نارد و عوبەیداللە پەنجا هەزار درهەمی بەو کەسە بەخشی کەخەڵاتەکەی بۆ هێنا.

## شۆڕش لەدەوروبەری موسڵ

لەم ساڵەدا لەنێوان سلێمان کوڕی عیمرانی ئەزدی و هۆزی عەنزە جەنگ کەوتەوە.

چۆنیەتی ئەم جەنگە بەم شێوە بوو: سلێمان بەشێك لەزەوییەکانی مەرجی کڕی. دواتر یەکێك لەپیاوانی عەنزە بەناوی بەرهونە داوای شوفعەی[٢٩] لەسلێمان کرد. سلێمان گرنگی بەوتەکەی نەدا. بەرهونە ڕۆشتە لای عەنزە. هۆزی عەنزە لەزابین نیشتەجێ بوون. ئەو داوای هاوکاری لەوان و مناڵەکانی شەیبان کرد و دەستەیەکی فراوان لەدەوری کۆبوونەوە و ئەم دوو هۆزە لەتاڵان کردنی دەوروبەری موسڵ، زێدەڕۆییان کرد.

سلێمان لەموسڵ هێزەکانی کۆکردەوە و بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانەی کردن. لەزاب تێپەڕی و جەنگێکیماڵوێرانکەر لەنێوانیان هەڵگیرسا. جەنگ لەکەنار دەروازەی شەمعون ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر لەهەر دوو هۆز کوژران. سەری کوژراوەکانیان بردە موسڵ کەزیاتر لەدووسەد سەر بوو.

حەفس کوڕی عەمرۆ باهلی هۆنراوەیەکی هۆنیوەتەوە و تیایدا ئاماژە بەم جەنگە دەدات:

شهدت مواقفنا نزار فاحمدت          كرات كل سميدع قمقام

---

[٢٩] شوفوعە: ماف لەپێشی دراوسێیەتییە لەخاوەنداریەتی زەوی لەسەر هەموو کڕیارەکان بەناچاری یا بەمەرجی تایبەت.

جاءوا و جئنا لا نفيتم صلنا ضربا يطيح جماجم الاجسام

واتاکەی: هۆزەکانی نزار جەنگەکانی ئێمەیان بینی و هێرشی بوێرە گەورەکانی ئێمەیان وەسف کرد. ئەوان هاتن وئێمە هاتین. حەفیای ئێمە دوور مەکەنەوە. بەگورزێکەوە هاتین کەسەر لەجەستە جیا دەکاتەوە.

قەسیدەیەکی دوور و درێژە. لەم ساڵەدا لەدەوروبەری موسڵ، دووبارە جەنگ و ئاژاوە سەری هەڵدا و حوباب کوڕی بوکەیری تەلیدی لەو جەنگانەدا کوژرا. هۆکاری جەنگەکە ئەوە بوو محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی سەیید کوڕی ئەنسی تەلیدی ئەزدی دوو گوندی کڕی کە لەگرێوی محەممەد کوڕی عەلی تەلیدیدا بوو. حوباب پێی وت: نامەیەك لەبوغا بێنە تا ئەم دوو گوندەی لێ بستێنم. چوارپێ و خەرجی ڕێگەی پێدا. مالك ڕۆشتە سامەرا و نامەیەکی بوغای هێنا کەفەرمانی بەحوباب دەدا ئەو دوو گوندە لە محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی سەیید بستێنێت. ئەویش ئەو کارەی کارد و چەند کەسێکی نارد تا ئەم دوو گوندە لەمحەممەد بستێنن. لەنێوان ئەوان چەندین نامە ئاڵوگۆڕ کرا و پەیمانی ئاشتییان بەست.

دوای ئاشتی ڕۆژێك محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی سەیید و حوباب لەباغێکدا دانیشتبوون و عەرەقیان دەخواردەوە. کەنیزێکان لەگەڵدا بوو. حوباب داوای لەکەنیزەکە کرد ئەم هۆنراوەیە بەگۆرانی بخوێنێت:

متى تجمع القلب الزكي و صارما و انفا حميا تجتنبك المظالم

واتاکەی: هەرکات دڵی ڕوون و شمشێر و سرشت بەرزی پێکەوە کۆبکەیتەوە، ستەم لای تۆ کۆچ دەکات.

کەنیز خوێندی و محەممەد کوڕی عەبدوللە تووڕە بوو. داوای لەکەنیزەکە کرد ئەم هۆنراوەیە بەگۆرانی بخوێنێت:

كذبتم و بيت الله لا تأخذونها مراغمة مادام للسيف قائم

و لا صلح حتى تقرع البيض بالقنا و يضرب بالبيض الخفاف الجماجم

واتاکەی: درۆتان کرد، سوێند بەماڵی خوا، ئێوە تا ئەو کاتەی شمشێرتان بەدەستەوە، نایگرن، هیچ سازانێك لەئارادا نابێت تا ئەو کاتەی بەڕم لەشمشێرەکان بدرێت و بەشمشێرە تیژ و سووکەکان، سەر لەجەستەکان جیا بکرێتەوە.

ئەم دوانە بەو شێوەیە لەیەك جیابوونەوە و هەركەس ڕقی ئەوی دیكەی لەدڵ گرتبوو. حوباب دووبارە نوێنەرەكانی بۆ ئەو دوو گوندە نارد. محەممەدیش دەستەكەی كۆكردەوە. پەیكەكان دووبارە پەیامی ئاشتیان برد و هێنایان و هەركام وەڵامیان دایەوە. محەممەد بڵاوەی بەدەستەكەی خۆی كرد. دواتر بیستی كەحوباب وتوویەتی: ئەگەر محەممەد چوار كەسی لەگەڵدا بێت، بەئاشتی ڕازی نابێت. لەم قسەیە توڕە بوو و دەستەیەكی فراوانی كۆكردەوە و هەنگاوی یەكەمی بۆ جەنگ لەگەڵ حوباب هەڵگرت. حوباب ڕووبەڕووی بوویەوە. شەڕ لەنێوان ئەوان هەڵگیرسا و حوباب و كوڕەكەی و دەستەیەك لەهاوەڵانی كوژران. ئەم ڕووداوە لەزیقەعدە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ڕوویدا.

### بیر كردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ئەحمەد كوڕی متوەكیل (برای موعتەزی خەلیفە و سوپاسالار) بۆ بەسرە دوورخرایەوە و دواتر گەڕاندیانەوە بۆ بەغداد و لەبەشی ڕۆژهەلات لەكۆشكی دیناری فەردوش نیشتەجێیان كرد.

لەم ساڵەدا موزاحیم كوڕی خاقان لەمانگی زیحەججە/ دێسامبەر لەمیسر مرد.

لەم ساڵەدا عەبدوللە كوڕی محەممەد كوڕی سلێمانی زەینەبی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی موعاز لەكەنارەی مەڵتییە جەنگی دەستپێكرد بەڵام هەڵات و سەرئەنجام دیل كرا.

لەم ساڵەدا موسا كوڕی بوغا و كەوكەبی عەلەوی لەقەزوێن ڕووبەڕووی یەكبوونەوە. كەوكەبی هەڵات و پەیوەسیتی دەیلەمییەكان بوو. چۆنیەتی ئەم شكستە بەم شێوە بوو: كاتێك هەردووك بۆ جەنگ ریزیان بەست، هاوەڵانی كەوكەبی قەڵغانەكانیان خستە بەر ڕوخساری خۆیان و بەم شێوەیە خۆیان لەتیربارانی سوپاكەی موسا پاراست. كاتێك موسا بینی تیرەكان كاریگەری لەسەر سوپاكەی دوژمن دانانێت، فەرمانیدا نەوت لەسەر زەوی بڕێژن و دواتر فەرمانی پاشەكشێی دەركرد. ئەو كارەیان كرد و كەوكەبی و سوپاكەی گومانیان كرد ئەوان

هەڵدێن. لەبەر ئەمە شوێنیان کەوتن و کاتێك گەیشتنە ناوەڕاستی زەوی نەوتاوی، موسا فەرمانیدا تیرە ئاگراوییەکان بهاوێژن و بەم شێوەیە قاچی هەموویان گڕی گرت و سووتان و سەرئەنجام شکستیان خوارد. ئەوان هەڵاتن و پەنایان بردە بەرقەزوێن. موسا شوێنیان کەوت و هاتە ناو قەزوێن.

لەزیحەججە/ دیسامبەری ئەم ساڵە موساوری خارجی لەکەنارەکانی جەلەولا شەڕی لەگەڵ سوپای خەلیفە کرد. موساور شکستی بەو سوپایە هێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا سوپای موسوڵمانان لەئاندۆلۆس ڕێگەی سەرزەمینی ناباوەڕانیان گرتەبەر و قەڵاکانی جەرنیقیان کرد و گەمارۆیان خستە سەر فوتب (؟) و دەستیان بەسەر بەشێکی زۆری دیوارەکەیدا گرت.

سەرەتای فەرمانڕەوایی یەعقوبی سەفاری و زاڵبوونی ئەو بەسەر هەرات و بوشەنج

یەعقوب کوڕی لەیس و براکەی عەمرۆ لەسیستان مزگەر بوون و خۆیان بەگۆشەگیر و هەژار لەقەڵەم دەدا. لەو رۆژگارەدا پیاوێك لەدانیشتوانی سیستان خۆی بەپێشەنگ لەجەنگ لەگەڵ خەواریج دەناساند. ئەم پیاوەیان بەساڵحی مەتوعی ناو دەبرد. یەعقوب بووە هاورێی و شان بەشانی ئەو جەنگی. بوو بەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی تا ئەو جێگەی ساڵح ئەوی وەك جێگری خۆی دیاریکرد. ساڵح مرد و پیاوێك بەناوی درهەم جێگەی گرتەوە. یەعقوب هەمان پێگەی لای درهەم پێبڕا کەلای ساڵح بووی.

دواتر فەرمانڕەوای خوراسان لەکاتی بەرز بوونەوەی پێگەی درهەم و زۆربوونی هاوەڵانی ڕێگی فرت و فێڵی گرتەبەر و بەسەریدا زاڵبوو. ئەوی بردە بەغداد وزیندانی کرد. دواتر لەزیندان هاتەدەر و لەبەغداد خزمەتی خەلیفەی دەکرد.

دوای گیرانی درهەم، پێگەی یەعقوب بەرز بوویەوە و لەجیاتی درهەم بوو بەسرکردەی خۆبەخشەکان و بۆ جەنگی خەواریج بەرێکەوت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. ئەوەندەی نەمابوو بەتەواوی لەناویان ببات. یەعقوب گوندەکانی ئەوانی وێران و بەفرت و فێڵ و چاکەکاری

بەشێوەیەك دەستەمۆی کردن کەگوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون. پێگەی بەرز بوویەوە و دەستی بەسەر سیستاندا گرت و وای نیشان دەدا جێبەجێکاری فەرمانەکانی خەلیفەیە. ئەو نامەی بۆ خەلیفە دەنووسی و وای نیشان دەدا فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ دەکات و خەلیفە فەرمانی جەنگ لەگەڵ خەوارجی پێداوە. سیستانی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و ڕێگەکانی پاراست. فەرمانی بەچاکەکاریدا و ڕێگەی لەخراپەکاری گرت. شوێنکەوتەکانی زیادیان کرد. ئەو لەشوێنکەوتنی خەواریج زیاتر ڕۆشتە پێش و فەرمانڕەوای خوراسانی هێنایە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

ئەو لەم ساڵەدا لەرێگەی خوراسان رووی کردە هەرات تا دەستی بەسەردا بگرێت. فەرمانڕەوای خوراسان لەو کاتەدا محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر کوڕی حسەین و کارگوزاری ئەو لەهەرات محەممەد کوڕی ئەوسی ئەنباری بوو. ئەو لەگەڵ سوپایەکی تەیار و شکۆیەکی فراوان و جل و بەرگی گرانبایی بۆ جەنگی یەعقوب بەرێکەوت. دوو سوپا جەنگێکی خوێناوییان دەستپێکرد بەڵام کوڕی ئەوس شکستی خوارد و یەعقوب دەستی بەسەر هەرات و بوشەنجدا گرت. لەم کاتەدا تەناف فەرمانڕەوایەتی ئەو بەهێزبوو. بەم شێوەیە فەرمانڕەوای خوراسان و فەرمانڕەواکانی دیکە ترسی ئەویان لێ نیشت.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و چواری کۆچی ( ٨٦٦ زایینی )

## چۆنیەتی کوژرانی بوغای شەرابی

لەم ساڵەدا بوغای شەرابی کوژرا. چۆنیەتی کوژرانی ئەو بەم شێوە بوو: بوغا، موعتەزی بۆ ڕۆشتن بۆ بەغداد هان دەدا بەڵام موعتەز حەزی بەم جێگۆرکێیە نەدەکرد و رازی نەدەبوو. کاتێك بوغا سەرقاڵی پەیوەندی هاوسەرگیری کچەکەی لەگەڵ ساڵح کوڕی وەسیف بوو، موعتەز سوار ئەسپ بوو ولەگەڵ ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل مەبەستی کەرخی سامەرای کرد و ڕۆشتنە سەردانی بابەکیالی تورك و هاوەڵای ئەو کەدژایەتی بوغایان دەکرد.

هۆکاری ناسازگاری بابەکیال لەگەڵ بوغا ئەوە بوو ڕۆژێك هەردووك بۆ شەراب خواردنەوە دانیشتبوون. لەم کاتەدا یەکێك لەوان لەگەڵ هاورێکەی خۆی دەنگی بەرز کردەوە و بەمشێوەیە بابەکیال خۆی لەبوغا دەشاردەوە.

کاتێك موعتەز گەیشت، دانیشتوانی کەرخ وپیاوماقوڵان لەدەوری کۆبوونەوە و لەگەڵ موعتەز ڕۆشتنە کۆشکی سامەرا. بوغا ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ پێنسەد گەنج لەمناڵەکان و سەرکردەکان بەرێکەوت و گەیشتە سن. هاوەڵانی سکاڵایان بەرز کردەوە و لەسەختی رێگە و ئەوەی نەخێوەتیان هەڵگرتووە و نە جلی زستانەیان پێیە، گلەییان دەکرد. یەکێك لەوان هاتە لای بوغا و لەگفتوگۆی خەڵکان ئاگاداری کردەوە: بوغا وتی: ئەمشەو وازم لێ بێنن تا ئەندێشە لەکارەکانی خۆم بکەم.

کاتێك تاریکی باڵەکانی خۆی بڵاو کردەوە، بوغا لەگەڵ دوو خزمەتکار و نۆزدە کیسە دینار و سەد کیسە درهەم، بێ هیچ کەرەستەیەکی جەنگ یا چەقۆ یا هەر شتێکی دیکە، سوار بەلەم بوو. هیچ یەك لەسەربازەکانی ئاگادار نەبوون.

موعتەز لەنەبوونی بوغا نەدەخەوت مەگەر بەجل و بەرگی ڕەسمی و شمشێرەوە. بوغا ڕۆشت و دوای تێپەڕینی سێ بەشی شەو گەیشتە پردەکە. پاسەوانەکانی پرد کەسیان نارد تا بیناسنەوە. ئەو بەسەر نێردراوەکەدا قیژاندی و نێردراو گەڕایەوە. بوغا ڕۆشتە کۆشکی خاقانی. چەند کەس لەپاسەوانەکان خۆیان پێگەیاند. بوغا ڕووبەڕوویان وەستا و وتی: من بوغام، یا لەگەڵ من بۆ لای ساڵح

کوڕی یوسف وەرن یا مەیێنە ناو ماڵەکەی من تا چاکەتان لەگەڵ بکەم. دەستەیەك ئەویان گرت و ڕەوانەی لای موعتەزیان کرد و ئاگاداریان کردەوە. موعتەز فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. بوغایان کوشت و سەریان بردە لای موعتەز. سەری ئەویان لەبەغداد وسامەرا هەڵواسی و مەغربییەکان جەستەی ئەویان سوتاند. بوغا دەیویست لای ساڵح کوڕی یوسف خۆی بشارێتەوە تا ئەو کاتەی جەژن دەگات (جەژن ئەوەندەی نەمابوو) و کاتێك خەڵکان بەجەژنەوە سەرقاڵن، هاوڕێ لەگەڵ ساڵح شۆڕش بکات و موعتەز لەناو ببات.

## سەرەتای کاری ئەحمەد کوڕی تولون

سەرزەمینی میسر پێشتر لەژێر فەرمانی بابەکیال یەکێك لەگەورەترین سەردارەکانی تورك بوو. ئەو لەسامەرا مابوویەوە و تولون بەنوێنەرایەتی ئەو فەرمانڕەوایەتی میسری دەکرد کەباوکی ئەحمەد کوڕی تولونە و خۆیشی تورکە. ئەحمەد دوای باوکی چاکەکاری و شێوازێکی باشی گرتەبەر. کاتێك تولون مرد، بابەکیال بەدوای کەسێك دەگەڕا تا بەنوێنەرایەتی خۆی فەرمانڕەوایی میسری پێ بسپێرێت. ئەحمەد کوڕی تولونیان پێشنیاری کرد چوونکە لەچاکەکاری ئەو ئاگادار بوون. بابەکیال ئەوی وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشان و ڕەوانەی کرد. کوڕی مودەبر لەمیسر لێپرسراوی خەراج بوو و خۆسەرانە کارەکانی دەکرد. کاتێك ئەحمەد هات، دەستی کوڕی مودەبری کورت کردەوە و دەسەلأتی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا بلأو کرد.

بابەکیال، تەنیا فەرمانڕەوایی میسری بەئەحمەد کوڕی تولون سپاردبوو نەك ناوچەکانی دەوروبەر وەك ئەسکەندەرییە و شوێنەکانی تر. کاتێك موهتەدی بابەکیالی کوشت و میسری بەیارکوجی تورك سپارد، فەرمانڕەوایەتی هەموو ناوچەکانی دیکەیشی پێسپارد چوونکە پەیوەندییەکی توند و توڵ لەنێوانیاندا بوو. بەم شێوەیە پێگەی بەرز بووەوە و ڕۆژگاری درێژەی کێشا. (ئەمە لەبەخششەکانی خواوەند کە بەهەرکەس بخوازێت، دەیبەخشێت و خواوەند گەورترین بەخشندەیە).

## جەنگی نێوان موساوری خارجی و سوپای موسڵ

موساور کوڕی عەبدحەمید دەستی بەسەر بەشی زۆری موسڵ گرت و پێگەی بەرز بوویەوە. حەسەن کوڕی ئەیوب کوڕی ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی خەتابی عەدەوی تەغلەبی کەجێگری باوکی لەموسڵ بوو، بۆ جەنگی ئەو سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە کەحەمەدان کوڕی حەمدون باوەگەورێی فەرمانڕەواکانی حەمدانییە وکەسانی دیکە لەناو ئەم سوپایەدا دەبینران. حەسەن بۆ رووبەروو بوونەوەی موساور ڕۆشت و لەرووباری زاب گوزەری کرد. موساور لەشوێنەکەی خۆی پاشەکشێی کرد و لەشوێنێك بەناوی وادی ئەلزوریات، دابەزی. ئەم ناوچەیە دۆڵێکی قووڵ بوو. حەسەن بەدوایدا گەڕا و هەردووك لەجومادی الاوەل/ ئاوریل بەیەك گەیشتن. شمشێریان دەرکێشا و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. سوپاکەی موسڵ شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ژمارەیەکیان کەوتنە ناو دۆڵەکە. ژمارەی ئەو کەسانەی کەوتنە ناو دۆڵەکە و کوژران لەژمارەی کوژراوان لەناو گۆڕەپانی جەنگ زیاتر بوو. حەسەن رزگاری بوو و خۆی گەیاندە حەزەی لەدەورویەری ئەربل (ئەربیل)ی ئێستا. محەممەد کوڕی عەلی کوڕی سەیید رزگاری بوو. شۆڕشییەکان گومانیان کرد حەسەنە و شوێنی کەوتن. ئەو کەشاسوارێکی بوێر بوو، رووبەروویان بوویەوە و جەنگی تا کوژرا. بەم شێوەیە پێگەی موساور زیاتر لەجاران بەرز بوویەوە و خەڵکان ترسی ئەویان لەدڵ نیشت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد کوڕی ڕەشید، مامی واسق و متوەکیل و مامی باوکی مونتەسیر و موستەعین و موعتەز مرد. براکانی ئەو ئەمین، مەئمون و موعتەسەم و کوڕەکانی براکەی، واسق و متوەکیل دوو کوڕەکەی موعتەسەم و کوڕەزاکانی دوو براکەی مونتەسیر، موستەعین و موعتەز لەسەر تەختی خەلافەت دانیشتن.

لەجومادی الاخرە/ مەی ئەم ساڵە عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسامەرا، مرد. ئەو یەکێك لەوکەسانە بوو ئیمامییە، باوەڕیان بەئیمامەتی ئەو هەیە (ئیمام هادی). باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند. لەساڵی ٨٢٧/٢١٢ چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی وەسیف فەرمانڕەوای میسر و قینسرین و پایتەختەکانی بەدیوداد سپارد.

لەم ساڵەدا موفلیح لەگەڵ دانیشتوانی قوم جەنگی و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن.

لەم ساڵەدا دانیشتوانی ماردە لەئاندۆلۆس لەگەڵ محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر. هۆکارەکەی ئەوە بوو ئەوان پێشتر ناسازگار و نەیاری باوکی بوون بەڵام بەسەر ئەوان سەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوان بلاّوەیان لێکرد. لەم ڕۆژەدا ئەوانەی ڕۆشتبوون، گەڕانەوە و شۆڕشیان کرد. محەممەد بۆ جەنگی ئەوان ئەسپی غاردا و گەمارۆی خستە سەریان و بارودۆخی لێ دژوار کردن. خەڵکان دووبارە گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. محەممەد ئەوان و سامانەکانیانی بۆ کوردوبا ڕەوانە کرد و دیواری ماردەی خاپور کرد. تەنیا ئەو شوێنەی کەکارگوزارەکان و فەرمانبەران لێی دەژیان، وەك خۆی هێشتەوە.

لەم ساڵەدا ئوردون کوڕی رودمیر، فەرمانڕەوای جەلیقییە لەئەندۆلۆس مرد و ئەزفونش جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەزفونش لەم کاتەدا زیاتر لەدوانزە بەهاری نەبینیبوو.

لەم ساڵەدا مانگ گیرا. گیرانی مانگ تەواو و هیچی لێ نەدەبینرا.

لەم ساڵەدا وشکەساڵی هەموو سەرزەمینەکانی ئاندۆلۆسی گرتەوە و لەساڵی ٨٦٥/٢٥١ زایینی تا ٨٦٩/٢٥٥ زایینی بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی خواوەند ئەم بەڵایەی لەسەر هەڵگرتن.

لەم ساڵەدا دۆلف کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلفی عیجلی گەیشتە ئەهواز و جوندیشاپور و شوشتەر و دووسەد هەزار دینار باجی کۆکردەوە و گەڕایەوە. باوکی فەرمانی ئەم کارەی پێدابوو.

لەرەمەزان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە، نوشەری هێرشی کردە سەر موساور و جەنگی کرد. موساور شکستی خوارد و هەڵات و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران.

عەلی کوڕی حسەین کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەباس کوڕی محەممەد(عەباسی) لەم ساڵەدا رێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی وەلید کوڕی عەبدوللە کوڕی قەتن، قیروانی نەحوی، لەقیروان چاوی لەجیهان بەست. ئەو لەنەحو و وشە وزمانی عەرەب پێشەوا و زانا بوو. دەستەیەك مەرگی ئەو بۆ ساڵی ٨٦٩/٢٥٥ زایینی دەگێڕنەوە کەراستتر بەرچاو دەکەوێت.

## رووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و پێنجی کۆچی (٨٦٩ زایینی)

## چۆنیەتی زاڵبوونی یەعقوب کوڕی لەیسی سەفاری لەکرمان

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیسی سەفاری دەستی بەسەر کرماندا گرت. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: عەلی کوڕی حسەین کوڕی شیبل، فەرمانڕەوای فارس نامەیەکی بۆ موعتەز نووسی و داوای لێکرد فەرمانڕەوایی کرمانی پێ بسپێرێت. ئەو لەم نامەدا ئاماژەی بەناتەوانی بنەماڵەی تاهیردا و بۆ نەشیاو بوونی ئەوان چەندین بەڵگە و شایەتی هێنایەوە کەیەعقوب سیستانی لەدەست ئەوان دەرهێناوە. عەلی کوڕی حسەین کوڕی شیبل لەڕەوانە کردنی باجی فارس کەمتەرخەمی دەکرد.

موعتەز فەرمانڕەوایەتی کرمانی پێ سپارد و لەهەمان کات فەرمانڕەوایەتی کرمانی بەیەعقوب کوڕی لەیس بەخشی تا بەم کارەی بۆ کوشتنی یەکتر هانیان بدات بۆ ئەوەی لەدەست یەکیان ئاسوودە بێت و تەنیا یەکیان بمێنێتەوە. هەرکام وای نیشان دەدا فەرمانەکانی خەلیفە جێبەجێ دەکەن بەڵام هیچ کام ڕاست نەبوون. موعتەز ئەمەی بەباشی دەزانی و لەبەر ئەمە عەلی کوڕی حسەین کوڕی تەوق کوڕی موغلیسی بۆ کرمان نارد. یەعقوب بەرەو کرمان ئەسپی غاردا بەڵام عەلی کوڕی حسەین پێشی کەوتەوە و زووتر خۆی گەیاند. یەعقوب تا دووری یەك مەنزڵ لەکرمان پێشڕەوی کرد. بۆ ماوەی دوو مانگ لەوێ مایەوە و بەرەو تەوق نەڕۆشت. تەوقیش ڕووبەڕووی نەبوویەوە. کاتێك مانەوەی درێژەی کێشا، یەعقوب وای نیشاندا مەبەستی سیستانی هەیە و دوو مەنزڵ گەڕایەوە. هەواڵی گەڕانەوەی ئەو بەتەوق گەیشت گومانی کرد یەعقوب دەستی لەکرمان و جەنگ هەڵگرتووە. لەبەر ئەمە کەرەستەی جەنگی فرێدا و سەرقاڵی ڕابواردن و خۆشی بوو.

یەعقوبیان ئاگادار کردەوە کەتەوق سەرقاڵی خواردنەوەیە. یەعقوب گەڕایەوە و دوو مەنزڵ ڕێگەی لەماوەی یەك ڕۆژدا بڕی. تەوق کاتێك هاتە خۆی کەتەپ و تۆزی سمی ئەسپەکانی یەعقوب بەرز بوویەوە. وتی: ئەم دەنگەدەنگە چییە؟ وتیان: تەپوتۆزی مەڕومالاتی خەڵکانی گوند. هێشتا نەکەوتبوویە خۆ کەیەعقوب هات و

گەمارۆی خستە سەر خۆی و هاوەڵانی. ئەوان بەرگرییان لەخۆیان کرد. یەعقوب بەهاوەڵانی وت: ڕێگەیان بۆ بکەنەوە. ئەوان هەڵاتن و ئەوەی بوویان ڕزگاریان کرد و یەعقوب تەوقی ئەسیر کرد.

عەلی کوڕی حسەین چەندین سنووقی بەتەوقدا ناردبوو پڕ لەزنجیر بۆ ئەوەی هاوەڵانی یەعقوبی پێ ببەستێتەوە. هەروەها چەندین سنوق لێوانلێو لەدەستبەند و بازوبەند بۆ ئەو کەسانەی بوێری و ئازایەتی لەخۆیان نیشان دەدن. کاتێك یەعقوب دەستی بەسەر ئوردووگاکەی ئەواندا گرت، ئەم سنوقانەی بینی و پرسیاری کرد و تەوق ڕاستییەکانی پێ وت. یەعقوب دەستبەند و بازووبەندەکانی بەهاوەڵانیدا و هاوەڵانی عەلی، بەزنجیرەکان بەستەوە. کاتێك دەستی تەوقیان بردە پێش بۆ ئەوەی بەزنجیر بیبەستنەوە، یەعقوب بینی دەستی بەدەستماڵێك بەستووە و پرسیاری لێکرد. تەوق وتی: جۆرێك نەخۆشیم لەدەستمدا هەست پێکرد و ڕەگم بڕی. دەمویست خوێنی لێ بگرم (لەبەر زۆری خواردنەوەی شەراب) لەم کاتەدا یەعقوب فەرمانیدا جزمەکانی بۆ داکەنن. کاتێك پێلاوەکانیان بۆ داکەند، وردە نانی وشکی لێ هاتەدەر. وتی: ئەی تەوق، ئەمە پێلاوی منە و دوو مانگە لەپێمدایە و نانم لەوێدا هەڵدەگرت. بەردەوام لەو نانەم دەخوارد و تۆ سەرقاڵی خواردنەوە بوویت. یەعقوب هاتە کرمان و خستییە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

## چۆنیەتی زاڵبوونی یەعقوب لەفارس

لەچواری جومادی الاوەل/ بیست و یەکی ئاوریلی ئەم ساڵە یەعقوب کوڕی لەیسی سەفاری دەستی بەسەر فارسدا گرت. کاتێك هەواڵی هەڵس وکەوتی یەعقوب لەگەڵ تەوق بەگوێی عەلی کوڕی حسەین کوڕی شیبل لەفارس گەیشت، دڵنیا بوو لەوەی یەعقوب هێرشی دەکاتەسەر. عەلی لەم کاتەدا لەشیراز بوو. ئەو سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و ڕۆشتە گەروی دەرەوەی شیراز و خۆی بۆ جەنگ ئامادە کرد. لایەکی ئەم گەروە کوێستانێکی دژوار و لایەکی دیکە ڕووبارێك بوو کەگوزەر کردن لێی ئەگەری نەبوو. عەلی کوڕی حسەین لەگەڵ سوپاکەی ڕێگەی گەرووەکەی گرت و لەو دەوروبەرە ئوردووی لێدا. ئەو ڕێڕەو ئەوەندە تەسك بوو

دەبوا یەك یەك لێی گوزەر بکەن. ئەولای گوزەرگاکە بیابان بوو. عەلی وتی: یەعقوب ناتوانێت خۆی بەئێمە بگەیێنێت کەواتە سوپاکەی لەوێ بەجێهێشت و خۆی ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.

یەعقوب ئەسپی غاردا و خۆی لەگەرووەکە نزیك کردەوە و لەدووری یەك میل ئوردووی لێدا. خۆی لەگەڵ پیاوێکی دیکە بەرێکەوت. سەیرێکی گەرووەکەی کرد. سوپا و هاوەڵانی عەلی کوڕی حسەین جوێنبارانیان کرد بێ ئەوەی وەڵامیان بداتەوە. دواتر بۆ لای سوپاکەی گەڕایەوە و بۆ نیمەڕۆی ڕۆژی دواتر لەگەڵ هاوەڵانی ڕێگەی گەرووەکەیان گرتەبەر کەرووبەرووی کرمان بوو. فەرمانی دابەزینی بەسوپاکەیدا و بارەکانیان خستە سەرزەوی. سوار ئەسپە بێ زینەکان بوون. یەعقوب سەگێکی پێ بوو، خستیە ناو ئاوەکە. سەگەکە بەمەلە کردن خۆی گەیاندە ئوردووگای حسەین کوڕی عەلی. عەلی کوڕی حسەین و سوپاکەی سەیری سەگەکەیان کرد و قاقا پێکەنین.

یەعقوب، خۆی و هاوەڵانی بەئەسپ پەڕینە ناو ئاوەکە ولەکاتێکدا ڕمیان بەدەستەوە بوو و لەپشت سەری سەگەکە مەلەیان دەکرد. کاتێك عەلی کوڕی حسەین، یەعقوبی بینی کەزۆرینەی ڕێگەکەی بڕیوە، سەرگەردان بوو. هاوەڵانی یەعقوب لەپشت سەری هاوەڵانی حسەین لەئاوەکە هاتنەدەر. کاتێك یەکەم دەستەی سوپاکەی یەعقوب لەئاوەکە هاتنەدەر، هاوەڵانی عەلی بەرەو شیراز هەڵاتن چوونکە ئەگەر سوپاکەی یەعقوب لەئاوەکە دەهاتنەدەر، ئەم دەستەیە لەنێوان سوپاکەی یەعقوب و گەرووەکە گرفتار دەبوون وچیتر هیچ پەناگەیەکیان دەست نەدەکەوت. عەلی کوڕی حسەین لەکاتی هەڵاتن لەئەسپەکەی کەوتەخوار. ئەویان گرت و بردیانە لای یەعقوب. یەعقوب زنجیری لەدەست و پێی کرد و سامانی ئوردووگاکەیان تاڵان کرد. دواتر ئەو شوێنەی بەجێهێشت و شەوانە ڕۆشتە ناو شیراز کەس لەشوێنەکەی خۆی نەجووڵا و کاتێك بەرەبەیان هات، هاوەڵانی یەعقوب کۆشکی عەلی و ماڵی هاوەڵانی ئەویان تاڵان کرد و ئەوی لەگەنجینەدا بوو، بردیان. دواتر باجیان کۆکردەوە و گەڕانەوە بۆ سیستان؟.

دەڵێن: دوای گوزەر کردنی یەعقوب لەرووبار، لەنێوان ئەو و عەلی کوڕی

حسەین جەنگێکی قورس روویدا چوونکە عەلی دەستەیەکی گەورە لەموالییەکان و کوردەکان و کەسانی دیکەی لەدەوری خۆی کۆکردبوویەوە و ژمارەی ئەوان لەسوار و پیادە دەگەیشتە پانزە هەزار کەس. ئەو سەربازەکانی خۆی لەباڵی چەپ و راست و دڵی سوپاکەی رازاندەوە. خۆی لەدڵی سوپادا جێگیر بوو. یەعقوب لەرووبارەکە گوزەری کرد و کاتێك سوپاکەی ئەو و سوپاکەی عەلی لەیەك شوێن رووبەرووی یەکبوونەوە، یەعقوب هێرشی کردە سەر سوپاکەی عەلی بەڵام سوپاکەی عەلی خۆڕاگری کرد. یەعقوب جارێکی دیکە هێرشی برد و لەم کاتەدا بوو سوپای دژمن پاشەکشێی کرد و بێ ئەوەی کەس رووبەرووی کەس ببێتەوە، هەڵاتن.

عەلی بەدوای ئەواندا رایدەکرد و هاواری دەکرد، سوێندی دەدان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە یا لەشوێنەکانی خۆیان بێستن بەڵام کەس گوێی لێ نەدەگرت. پیادەکان کوژران و هەڵاتووان دوای تاقێك لەرۆژ خۆیان گەیاندە دەروازەکانی شیراز و لەبەر ئەوەی لەبەر دەروازەکان قەرەباڵغی دروست بوو، لەکەنارەکانی فارس بڵاو بوونەوە. بەشێك لەوان درێژەیان بەرێگەدا و خۆیان گەیاندە ئەهواز.

کاتێك یەعقوب ژمارەی زۆری کوژراوەکانی بینی، فەرمانیدا دەست لەکوشتن هەڵگرن و ئەگەر ئەو فەرمانەی نەدەدا، تا دوایین کەسیان دەکوژرا. لەم جەنگەدا سێ هەزار کەس کوژران. عەلی کوڕی حسەین لەسێ شوێنەوە بریندار بوو. کاتێك ناسییانەوە، قۆڵبەستیان کرد. یەعقوب هاتە ناو شیراز. بەناو شارەکەدا سوڕا و ئەمانی بەهەموان بەخشی و خەڵکانی ئاسوودە کرد. بەهەموو شێوەیەك عەلی ئەشکەنجە کرد و هەزار هەنبانە و بەگومانێك چوارسەد هەنبانە وکەرەستەی جەنگە و ئەسپ و سامانەکانی دیکەی کۆکردەوە و فەرمانبەری خۆی بۆ خەلیفە نووسی و چەندین دیاری گرانبایی بۆ نارد کە بازی شکاری سپی و بازێکی دوو ڕەنگ و سەد مەن[٣٠]، موشك لەناویاندا دەبینرا. ئەو لەگەڵ عەلی و تەوق (کە هەردووك ئەسیر بوون) بۆ سیستان گەڕایەوە. کاتێك فارسی بەجێهێشت خەلیفە کارگوزارەکانی خۆی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد.

---

[٣٠] پێوانەیێکە بۆ کێشە (وەرگێر)

## چۆنیەتی لابردن و مەرگی موعتەز

لەرۆژی چوارشەممە بیست و حەوتی رەجەب/ دوانزەی ژوئەنی ئەم ساڵە موعتەز لەخەلافەت دوور خرایەوە و لەدووی شەعبان/ حەڤدەی ژوئییە مرد.

هۆکاری دوور خستنەوەی لەخەلافەت ئەوە بوو تورکەکان لەگەڵ راوێژکاران و گەورەکانی دیوان بەو شێوەی جووڵانەوە کەئاماژەمان پێدا بەڵام پارەیان دەستنەکەوت وو بۆ لای موعتەز بەرێکەوتن و داوای مانگانەی خۆیان کرد و وتیان: مانگانەی ئێمە بدە تا ساڵح کوڕی وەسیف لەناو ببەین. موعتەز پارەی نەبوو پێیان بدات. ئەوان بەپەنجا هەزار دینار شادمان بوون. موعتەز کەسی بۆ لای دایکی و داوای پارەی کرد تا پێیان بدات. دایکی وەڵامی دایەوە کەهیچ پارەیەك بوونی نییە.

کاتێك تورکەکان دڵنیا بوون لەوەی نە لەموعتەز هیچیان دەست دەکەوێت نە لەدایکی و نە لەگەنجینە، لەگەڵ مەغربی و فەرغانییەکان یەکیان گرت و بڕیاریاندا موعتەز لەسەر کار لاببەن. بەم شێوەیە مەبەستی موعتەزیان کرد و بەدەنگی بەرز هاواریان کرد. ساڵح کوڕی وەسیف و محەممەد کوڕی بوغا ناسراو بەباوکی نەسر و بابەکیال ئامادە بۆجەنگ ڕۆشتنە لای و لەبەر دەرگا وەستان و پەیکیان بۆ لای موعتەز نارد تا بڕواتە لایان. موعتەز وتی: دوێنێ دەرمانم خواردووە و ئەم دەرمانە ناسازی کردووم، ئەگەر کارێکی بەپەلەیە، کەسێکتان بێتە ژوور. موعتەز گومانی دەکرد بارودۆخ سەقامگیرە. دەستەیەك ڕۆشتنە لای و قاچیان گرت و تا لای دەروازەکە رایانکێشا و بەگورز لێیاندا. جلەکانیان دڕاند و لەگەرمای تاقەت پڕوکێن ئەویان بەپێوە وەستاند. موعتەز لەتاو گەرمی زەوی قاچێکی خۆی هەڵدەبڕی و قاچەکەی دیکەی دادەنا. دەستەیەك شەقەزللەیان لێدەدا و ئەو بەدەست بەرگری لەروخساری دەکرد. ئەویان بردە ژوورێك و کوڕی باوکی شەوارب (قازی قازییەکان) و دەستەیەکی دیکەیان بانگ کرد و بۆ دەست لەکار کێشانەوەی ئەو، وەك شایەت کۆیانکردنەوە. ئەوان ساڵح کوڕی وەسیفیان کردە شایەت کەموعتەز و دایکی و مناڵەکان و خوشکەکەی ئەو لەپەنادان.

تورکەکان کۆشکی دایکی موعتەزیان گەمارۆدا بەڵام ئەو پێش ئەم رووداوە

توتێلێکی لەناو کۆشکەکەیدا هەڵکەندبوو کەدەگەیشتە دەرەوە. دایکی لەگەڵ خوشکی موعتەز لەم ڕێگەوە هەڵاتن. ئەوان موعتەزیان بەکەسێك سپارد تا ئەشکەنجەی بکات. ئەو کەسە بۆ ماوەی سێ شەو و ڕۆژ خواردن و خواردنەوەی بەموعتەز نەدا. موعتەز کەمێك لەئاوی چاڵی داوا کرد بەلاّم پێیان نەدا. دواتر خستیانە ناو ساردخانەیەك و بەگەچ سواخیاندا و بەم شێوەیە موعتەز مرد. منالەکانی هاشم و گەورەکانیان بۆ مەرگی ئەو کردە شایەت کە لەکاتی مەرگ هیچ شوێنەوارێکی برین یا ئەشکەنجە بەجەستەیەوە نییە. ئەویان لای مونتەسیر بەخاك سپارد.

خەلافەتی ئەو لەڕۆژی بەیعەت تا دوورخرانەوە لەخەلافەت چوار ساڵ و شەش مانگ و بیست و سێ ڕۆژ درێژەی کێشا و تەمەنی لەبیست و چوار ساڵ تێپەری نەکرد. ئەو سپی، مووی ڕەش، چاوی جوان و کەمێك سورباو بالاّ بەرز بوو. لەسامەرا چاوی بەدنیا هەڵهێنا. زمانێکی کراوەی بوو. کاتێك موستەعین بەرەو بەغداد ڕۆشت، موعتەز دەستەیەك لەبیرمەندەکانی کۆکردەوە و پێی وتن: ئایا سەیری ئەم دەستەیە ناکەن کەدوو رووی ئەوان دەرکەوتووە؟ کەسانێکی ریسوا وسەرسەڕی کەهیچ ئایینێکیان نییە، نەتوانایان هەیە و نەدەناسرێنەوە. هەنگاونان لەلاری، خراپەکاری لەبەر چاوی ئەوان رازاندۆتەوە. ئەوان کەمن هەرچەند بەژمارە زۆر بن. هەرکات بیریان بێننەوە، سەرکۆنەیان دەکەن.

من دەزانم بۆ فەرماندەیی سوپا و پاراستنی سنوورەکان و سەقامگیر کردنی کارەکان و بارودۆخ و بەرێوەبردنی سنوورەکان، پیاو دەبێت هەڵگری چوارتایبەتمەندی بێت:

دووربەندێشی تا لەبەر رووناکی بتوانێت لەکاتی روودانی پێشهاتەکان، سەرچاوەکەیان بدۆزێتەوە.

زانستێك کە لەنەزانی و خۆبەسەندی لەکارەکان، رێگری لێ بکات.

بوێری کە لەگەڵ بوونی نیازە یەك لەدوای یەکەکان، هیچ پێشهاتێك لەناوی نەبات.

و بەخششێك کەدانی زیادە لەکاتی پێدانی سامان لەکاتی داوا کردن خۆش

بکات و پەلە کردن لەقەرەبوو کردنەوەی چاکەکاری بۆ هاوەڵە شیاوەکان و تاڵ کردنی بارودۆخ لەگومڕا وسەرکێشەکان و ئامادە بوون بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو کارەساتانەی ئەگەری هەڵاتن لێیان نییە، لابردنی دەرگا لەبەردەم مسکێنەکان و داوەری دادپەروەرانە بۆ بەتوانا و ناتەوان و بەئاگا بوون لەکاروباەکان.

هەنووکە من بۆ ئەوان پیاوێك لەمواليیەکانم هەڵبژاردووە کەسەرسەختە و مەبەستەکانی خۆی بەئەنجام دەگەیینێت و خۆشی، سەرمەستی ناکات و رووداوە مەترسیدارەکان نایترسێنێت و ناترسێت لەوەی چی روودەدات و ئەوەی بەسەری بێت، نایلەرزێنێت. ئەو لەئسلام هاوشێوەی مارێکە ئەگەر بیجووڵێنن، دەپەرێت و هەرکات پێوە بدات کەس لەمەرگ رزگاری نابێت. توێشوی ئەو ئامادەیە و پێگەی بەرزە، لەگەڵ سوپایەکی کەم و دڵێکی رەقتر لەبەرد رووبەرووی دوژمن دەبێتەوە. تۆڵە دەستێنێت وسوپای دوژمن نایترسێنێت. شکۆی هەیە و نیازی بەهێزی زیاتر نییە. بەدیهێنانی نیازەکانی نیازەکەی ئەو ناتەوان ناکات و هەر کەس هەڵبێت، لەدەستی ئەو دەرباز نابێت، ئاگری هێزی ئەو بڵێسەدارە کوڵەکەی بوونی، بڵندە. ناوبانگ نابێتە هۆی دروست بوونی تەماح لای و سەختییەکان ناتەوانی ناکەن. هەرکات بۆ کارێك راسپێردرێت، شیاوە و هەرکات قسەیەك بێنێتە سەر زمان، پەیمانێکە، هەرکات بڕواتە گۆڕەپان، بوێری لەخۆی نیشان دەدات و ئەگەر بەڵێنێك بدات، دەیباتەسەر. سێبەری بۆ هاوڕێ بەرز و شکۆی لەجەنگ، نیشانەی ئەوە. لەهەرکەسێك خوازیاری پێشکەوتن لەوی هەبێت، لەپێشترە و هەرکەس رێگەی ناسازگاری ئەو بگرێتەبەر، ناتەوان دەبێت و هەرکەس رکەبەرایەتی بکات، هیلاك دەبێت و هەرکەس هاورێیەتی بکات، گیانێکی تازە دەگرێت.

## خەلافەتی موهتەدی

لەرۆژی چوارشەممە، شەوی بیست و نۆی رەجەب/ چواردەی ژوئیە، بەیعەتیان لەگەڵ محەممەد کوڕی واسق بەست و نازناوی موهتەدی باللە یان پێ بەخشی. پێشتر ئەویان بەباوکی عەبدوللە ناو دەبرد. دایکی موهتەدی(رۆمی ) کەنیز بوو و بەقورب ناو دەبرا. کەس بەبەیعەتی ئەو رازی نەببوو. موعتەزیان بردە لای ئەو و خۆی لەخەلافەت دوور خستەوە و دانی بەوەدا نا بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی خەلافەت ناتەوانە. ئەو حەزی بەخەلافەتی موهتەدی دەکرد و مەبەستەکەی خۆی دەربڕی. دواتر هەمووان و کەسە نزیك و تایبەتەکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

## شۆڕشی بەغداد

لەکۆتایی مانگی رەجەبی ئەم ساڵە، هەموان لەبەغداد شۆڕشیان کرد و هێرشیان کردە سەر سلێمان کوڕی عەبدوللە.

هۆکاری ئەم شۆڕشە ئەوە بوو نامەی موهتەدی خەلیفە لەکۆتایی مانگی رەجەب/ پانزەی ژوئییە بەسلێمان گەیشت. لەم نامەدا فەرمانی پێدرابوو بۆ موهتەدی بەیعەت وەربگرێت. لەم کاتەدا باوکی ئەحمەد کوڕی متوەکیل (برای موعتەز) بەفەرمانی موعتەز بۆ بەغداد دوور خرابوویەوە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا. سلێمان کەسی بەدوای باوکی ئەحمەد نارد و ئەوی لەماڵەکەی خۆی جێگە کردەوە. سوپاییەکان و خەڵکانی بەغداد بەسەرهاتی موعتەز و واسقیان بیست و لەبەر دەرگای کۆشکی سلێمان کۆبوونەوە. هاوەڵانی سلێمان رووبەروویان بوونەوە. دواتر پێیان وترا هێشتا لەسامەراوە هیچ هەواڵێك بۆ لەسەر کارلابرانی خەلیفە بەدەستی ئێمە نەگەیشتووە و ئەوان گەڕانەوە.

بەیانی ئەو رۆژە کەهەینی بوو، دووبارە هاتنەوە. لەرۆژی هەینی لەبەغداد وتار بەناوی موعتەز خوێندرایەوە و دووبارە ئەوان گەڕانەوە و بەرەبەیانی رۆژی شەممە هاتن و هێرشیان کردە سەر کۆشکی سلێمان و ناوی باوکی ئەحمەدیان وەك خەلیفە برد و پێشنیاری بەستنی بەیعەتیان پێکرد. داوایان لەسلێمان کرد باوکی

ئەحمەدیان نیشان بدات. سلێمان باوکی ئەحمەدی نیشاندان و بەڵێنی پێدان ئەگەر ئەوەی پەسەندی ناکەن، دواکەوێت، لایەنگیری لەخواستەکانی ئەوان دەکات. دواتر لەسامەراوە پارەیان بۆ ڕەوانە کرا تا بەیعەت لەگەڵ موهتەدی ببەستن. پارەکەیان لەناو ئەواندا دابەش کرد و ئەمە بووە هۆی شادمانی ئەوان و بەمشێوەیە لەحەوتی شەعبان/ بیست و دووی ژوئیە، بەیعەتیان لەگەڵ موهتەدی بەست وئاژاوە دامرکایەوە.

## دەرگەوتنەوەی قەبیحە دایکی موعتەز

پێشتر وتمان قەبیحە لەکاتی کوژرانی کوڕەکەی خۆی شاردەوە. هۆکارەکەی ئەوە بوو ئەو لەگەڵ کەسانی ناو دەربار بڕیاریاندا سالح کوڕی وەسیف لەناو ببەن. کاتێك سالح بەمەی زانی، ئەوانی گرت وئەشکەنجەی کردن. قەبیحە زانی ئەوان راستییەکان دێننە سەرزمان و لەکوژرانی خۆی دڵنیا بوو. لەبەر ئەمە هەموو پارە و گەنجینەکانی لەکۆشك بردە دەر و بەکەسە بڕواپێکراوەکانی خۆی سپارد و بیری لەرێگە چارەیەك کردەوە. ئەو لەژوورەکەی خۆیەوە تونێلێکی هەڵکەند و گەیشتە شوێنێکی دوور. کاتێك موعتەز ئەو چارەنوسەی پێ برا، لەتونێلەکەوە ڕۆشتەدەر. کاتێك ئاژاوەگێران موعتەزیان کوشت، بەدوای قەبیحەدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە. ئەوان لەبوونی تونێلەکە ئاگادار بوونەوە و ڕۆشتنە ناوی بەڵام دایکی موعتەزیان نەدۆزییەوە.

قەبیحە بەخۆی وت کەمناڵەکەی کوژراوە و ئەو کەسەی ئێستا لای ئەو خۆی شاردۆتەوە، چاوی تەماحی بڕیوەتە گیان و پارەکەی ئەو و دەخوازێت تەسلیمی سالحی بکات. لەبەر ئەمە ژنێکی بۆنفرۆشی بۆ لای سالح کوڕی وەسیف نارد. ئەو ژنە لەنێوان ئەوان نێوەنجیگەری کرد و قەبیحە لەحەشارگەکەی خۆی هاتەدەر. هاتنەدەری ئەو لەرەمەزان/ ئۆگۆست رویدا. سامانێکی زۆری لەبەغداد بوو، هەمووی لەگەڵ خۆی هێنا. سامانی ئەو پێنسەد هەزار دینار بوو. ئەوان گەنجەکانی ئەویان لەژێرزەمین هێنایەدەر. لەژێر زەمینەکەدا هەزار هەزار و سێسەد هەزار دینار و سەوەتەیەك زەموڕودی بێ وێنە و سەوەتەیەك مرواری گەورە و

سەوەتەیەك ساقوتی سور دۆزرایەوە. ئەم سامانەیان بردە کۆشکەکەی ساڵح. ساڵح جوێنی بەقەبیحەدا و وتی: ئەم هەمو پارەت لەداوێندا بوو و لەبەر پەنجا هەزار دینار کوڕەکەت بەکوشتندا.

قەبیحە ڕۆشتە مەککە. بەدەنگی بەرز ساڵح کوڕی وەسیفی نفرین دەکرد و دەیوت: ئەی خواوەندا! ساڵح ریسوا بکە چوونکە پەردەی ئابڕوی دڕیم و منداڵەکەی کوشتم و منی ئاوارە کرد ودەستی بەسەر سامانەکەمدا گرت و لەشارەکەم دووری خستمەوە و ئەو کارەی تری لەگەڵ من کرد. ئەو لەمەککە مایەوە.

متوەکیل لەبەر جوانی ناوی نابوو قەبیحە بەهەمان شێوە کە لەناو عەرەبەکان ڕەش پێستەکان بەکافور ناو دەبەن.

دەڵێن: دایکی موهتەدی پێش خەلافەتی ئەو مرد. ئەو ببووە هاوسەری موستەعین و کاتێك موستەعین کوژرا، موعتەز ئەوی لەکۆشکی روسافە جێگە کردەوە. ئەو لەوێ مرد و کاێك موهتەدی لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، وتی: من دایکم نییە ساڵانە دەهەزاردیناری داهاتی پێ بدەم تا خەرجی کەنیز و کۆیلە و کەسانی دەوروبەری بکات. ئەوەی من دەمەوێت توێشووە بۆ خۆم و منداڵەکانم و زیادتر لەوەم بۆ براکانم دەوێت چوونکە بارودۆخی ژیانیان تاڵ و دژوارە.

## کوژراتی ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل و باوکی نوح

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل کوژرا. ساڵح دوای گرتن و زەوت کردنی سامانی ئەو و حەسەن کوڕی مەخلەد، ئەشکەنجەی کرد. دواتر فەرمانیدا لەگەڵ باوکی نوح بەرادەیەك ئەشکەنجەیان بکەن تا گیانیان لەدەست بدەن. یەکی پێنسەد قامچییان لێدان و بەهۆیەوە هەردووکیان مردن.. حەسەن کوڕی مەخلەد لەزیندانادا مایەوە.

کاتێك موهتەدی لەبەسەرهاتی ئەو دوانە ئاگادار بوویەوە، وتی: ئایا جگە لەکوشتن و قامچی هیچ سزایەکی دیکە لەئارادا نییە؟ ئایا زیندان بەسەندە نییە؟ ئێمە لەخواین و بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە. چەند جارێك ئەم رستەی دووبارە کردەوە.

## فەرمانڕەوای سلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر لەبەغداد و شۆڕشی سوپا و خەڵکان

لەرەمەزان: ئۆگۆستی ئەم ساڵە، خەڵك و سوپای بەغداد دژی محەممەد کوڕی ئەوسی بەڵخی شۆڕشیان کرد. هۆکارەکەی ئەوە بوو محەممەد کوڕی ئەوس لەگەڵ سلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر وەك فەرماندەی سوپای خوراسان و ئەو کەسە سەرسەرییانەی لەو سەرزەمینەوە هاتن، لەخوراسانەوە هاتە بەغداد. سوپا و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو هاتبوون ناویان لەناو دیوانی بەغداد نەدەبینرا تا مانگانەیان پێ بدەن. نەریت بەو شێوە بوو ئەو کەسەی لەخوراسانەوە دەهاتە عێراق، بەئەندازەی ئەوانەی لەخوراسان لەسامان و زەوی میرات هەڵگرانی تاهیر کوڕی حسەیانیان وەریاندەگرت، وەربگرێت و ئەم فەرمانە بۆ خوراسان دەنوسرا تا لەوێ میراتخۆرەکان لەبەرابەر ئەو برە پارەی لەسامانی ئەوان دەدرا، لەسامانی گشتی وەربگرنەوە. کاتێك عوبەیدالله کوڕی عەبدوللە لەهاتنی سلێمان بۆ عێراق ئاگادار بوویەوە و زانی جڵەوی کاروبارەکان دەگرێتەدەست، هەموو سامانی گەنجینەی میرات هەڵگرانی هەڵگرت لەکاتێکدا بۆی ڕەوا نەبو و لەجوەیب لەرۆژهەلاّتی دیجلە مایەوە و دواتر بۆ رۆژهەلاّتی ئەو شوێنە ڕۆشت. کاتێك سلێمان هات و گەنجینەکەی بەبەتاڵ بینی، دنیا لەبەر چاوی تاریك بوو. ئەو لەمووچەی سوپای بەغداد، موچەی سوپاکەیدا و بەمشێوەیە سوپا و نۆکەرەکان، بۆ وەرگرتنی مانگانەی خۆیان کەوتنە جموجۆڵ.

ئەو کەسانەی لەگەڵ محەممەد کوڕی ئەوس لەخوراسانەوە هاتبوون، لەپێکەوە ژیانیان لەگەڵ خەڵکانی بەغداد ڕێگەیەکی خراپیان گرتەبەر و بەئاشکرا کارە قێزەونەکانیان ئەنجام دەدا و بەزۆر یەخەی ناموسی خەڵك و گەنجەکانیان دەگرت. دڵی خەڵکانی بەغداد لەرق و کینە، لێوانلێو بوو. خەڵك لەگەڵ سوپاییەکان یەکیانگرت و شۆرششیان دەستپێکرد. بەرەو زیندانی بەغداد لای دەروازەی شام ڕۆیشتن. دەرگای زیندانەکەیان شکاند و زیندانییەکانیان ئازاد کرد. لەنێوان سوپاکەی کوڕی ئەوس و دانیشتوانی بەغداد شەڕێکی قورس روویدا. کوڕی

ئەوس و هاوەڵ و منداڵەکانی پەنایان بۆ جەزیرە برد. خەڵك هاواریان کرد: هەرکەس خوازیاری تاڵانییە، پەیوەستی ئێمە بێت. زیاتر لەسەد هەزار کەس لەخەڵکان بەگشتی بەرەو جەزیرە بەرێکەوتن. سوپایش پەیوەستیان بوون. کوڕی ئەوس بۆ ماڵەکەی خۆی هەڵات و خەڵك شوێنیان کەوتن. تا نیوەی رۆژ شەڕ بەقورسی بەردەوام بوو. لەم ناوەدا کوڕی ئەوس بریندار بوو و لەگەڵ هاوەڵانی هەڵات. خەڵك شوێنیان کەوتن و لەدەروازەی شەماسییە دووریان خستنەوە. هەموو سامانی ناو کۆشکەکەیان تاڵان کرد. دەستەیەك بەهای کاڵا تاڵان کراوەکانی ئەو بە دوو هەزار هەزار درهەم دەخەمڵێنن. دانیشتوانی بەغداد ماڵی هاوەڵانی کوڕی ئەوسیان تاڵان کرد.

سلێمان کوڕی عەبدوللە پەیامی بۆ کوڕی ئەوس نارد تا رێگەی خوراسان بگرێتەبەر و ئاگاداری کردەوە کەهیچ رێگەیەك بۆ گەڕانەوە بۆ ناو شاری بەغداد نییە. ئەو رێگەی نەهرەوانی گرتەبەر و ئەوەی لەسەر رێگەی بینی، تاڵانی کرد و خراپەکاری کردە پیشە.

رێگەی خوراسان لەمانگی زیقەعدە/ ئۆکۆتبەر بەبابەکیالی تورك سپێردرا.

موساور کوڕی عەبدحەمید پیاوێك بەناوی موسای لەسەر رێگەی دەسکەرە و دەوروبەری لەگەڵ سێسەد پیاو، وەك نوێنەری خۆی دانابوو تا پارێزگاری لەرێگەی حولوان و شووش بکات کەگوزەرگای خوراسان و هۆزی جوخی بوو.

لەم ساڵەدا موهتەدی فەرمانیدا رووسپی و گۆرانیبێژەکان لەسامەرا دوور بخەنەوە. هەروەها فەرمانی کوشتنی دڕندە وەحشییەکانی ناو باغچەی ئاژەڵانی خەلیفەی دەرکرد و سەگەکانیان بەرەڵا کرد. فەرمانیدا قەرەبوی ستەم لێکراوەکان بکەنەوە و خۆی بۆ لێپرسینەوە لەسکاڵای خەڵکان دانیشت. ئەو کاتەی موهتەدی هاتەسەر کار، جیهان لێوانلێو بوو لەستەم و ستەمکاری.

## زاڵبوونی موفلیح لەتەبەرستان و گەڕانەوەی لەوێ

لەم ساڵەدا موفلیح بەرەو تەبەرستان بەرێکەوت و لەگەڵ حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی جەنگی. حەسەن هەڵات و پەنای بۆ دەیلەمییەکان برد. موفلیح ڕۆشتە ناو شارەکە و ماڵەکانی حەسەنی سووتاند و بۆ گرتنی ئەو ڕێگەی سەرزەمینی دەیلەمییەکانی گرتەبەر. موفلیح دوای ڕۆشتنە ناو بۆ تەبەرستان گەڕایەوە. موسا کوڕی بوغایش لەڕەی گەڕایەوە.

هۆکاری گەڕانەوەکەی ئەوە بوو قەبیحە دایکی موعتەز کاتێك شۆڕشی تورکەکانی بینی، نامەی بۆ موسا کوڕی بوغا نووسی و داوای لێکرد بڕواتە لای. هیوادار بوو پێش ئەو بەڵای بەسەر خۆی و کوڕەکەی هات، بگاتە لایان. موسا کوڕی بوغا بڕیاریدا بگەڕێتەوە. نامەیەکی بۆ موفلیحیش نووسی و داوای لێکرد لەتەبەرستان بگەڕێتەوە و لەڕەی پەیوەستی ببێت. نامەکە کاتێك بەدەستی موفلیح گەیشت کە ئەو بۆ گرتنی حەسەن کوڕی زەید بەرەو سەرزەمینی دەیلەمییەکان بەرێکەوتبوو. کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت، گەڕایەوە. ئەو خەڵکانەی لەترسی حەسەن لەتەبەرستان هەڵاتبوون، بۆ ماڵەکانیان گەڕانەوە و لەهۆکاری گەڕانەوەی موفلیحیان پرسی. موفلیح وەڵامی دانەوە کە لەفەرماندەوە نامەیەکی بەدەست گەیشتووە و دەبێت پەیوەستی ئەو بێت بەڵام موسا کوڕی بوغا نەیتوانی لەڕەی بڕواتەدەر تا ئەو کاتەی هەواڵی کوژرانی موعتەز و بەیعەتی موهتەدی بەدەست گەیشت. ئەوانیش بەیعەتیان لەگەڵ موهتەدی بەست.

دواتر موالییەکان (تورکەکان و سوپاییەکانی دیکە لەنۆکەرەکان و کۆیلەکان) کە لەناو سوپاکەی موسا بوون، لەتاڵان کاری ساڵح کوڕی وەسیف و سامانی فراوانی کەسانی نزیکی خەلیفە و موعتەز ئاگادار بوونەوە. ئەوان چاوی تەماحیان بڕییە دانیشتوانی سامەرا ( چوونکە ئەو بڕە پارە زۆرەیان دەستکەوتبوو). داویان لەموسا کوڕی بوغا کرد بگەڕێتەوە. موفلیح لەڕەی پەیوەستی موسا بوو. موسا مەبەستی ڕۆشتن بۆ سامەرای کرد بەڵام موهتەدی نامەی بۆ نووسی و داوای لێکرد بۆ ڕەی بگەڕێتەوە و پارێزگاری لەو سنورە بکات. موسا ڕازی نەبوو. موهتەدی دوو کەس لەمناڵەکانی هاشمی بۆ لای موسا نارد تا ئاگاداری بکەنەوە سامەرا گرفتاری قات و

قڕی هاتووە و ئەو (خەلیفە) لەزاڵبوونی عەلەوییەکان بەسەر تەبەرستان دەترسێت بەلاّم موسا گرنگی بەوتەکانی نەدا.

ساڵح کوڕی وەسیف گەڕانەوەی موسای لەبەرچاوی موهتەدی گەورە کرد و بەجۆرێك لەشۆڕش و ناسازگاری لەقەڵەمیدا و موهتەدی لەدواهاتەکانی ترساند. کاتێك نێردراوەکان گەیشتنە لای موسا و بۆ مانەوەی ئەو پێداگرییان کرد، مواليیەکان دەنگیان بەرز کردەوە مەبەستی ئەوەیان کرد هێرشیان بکەنەسەر. موسا لەوەلاّمدا داوای بەخشینی کرد و وتی سوپاییەکان بەگەڕانەوە بۆ ڕەی رازی نابن و تا نەگەنە بارەگای سەروەری باوەڕداران، گوێ لەقسە و فەرمانەکانم ناگرن. ئەو نوێنەرەکانی موهتەدی کردە شایەتی ‌بارودۆخەکە و ئەوەی ئەگەر بەخواستەکەی ئەوان رازی نەبێت، دەیکوژن. ئەو دەستەیەك لەسەردارەکانی لەگەڵ نێردراوان ڕەوانەی سامەڕا کرد و ئەوان لەساڵی ٢٥٦/٨٧٠ زایین گەیشتنە سامەرا.

## چۆنیەتی زاڵبوونی موساور لەموسڵ

کاتێك سوپاکەی موسڵ بەدەستی موساور شکستی خوارد -وەك ئاماژەمان پێدا- پێگەی موساور بەرز بووەوە و شوێنکەوتەکانی فراوان بوونز ئەو شوێنەکەی خۆی بەجێهێشت و گەیشتە موسڵ و لەدەروبەری شارەکە لای دێری ئەعلا ئوردووی لێدا. فەرمانڕەوای ئەو ناوچە، عەبدوللە کوڕی سلێمان، بەهۆی ناتەوانی بۆ جەنگی ئەو، خۆی لەجەنگ بەدوور گرت. دانیشتوانی موسڵ بەهۆی دژایەتیان لەگەڵ دەوڵەتی خەلافەت لەگەڵ ئەو نەجەنگان. موساور دەستەیەکی بۆ کۆشکی عەبدوللە، فەرمانڕەوای شار نارد و ماڵەکەیان سووتاند. موساور بێ هیچ جەنگێك ڕۆشتە ناوشارەکە و دەستدرێژی نەکردە سەر کەس.

بۆ رۆژی هەینی ڕۆشتە ناو مزگەوت و هەموو خەڵك یا بەشێکیان ئامادە بوون. ئەو ڕۆشتە سەر مینبەر و وتارێکی خوێندەوە، وتی: ئەی خواوەندا! بارودۆخی ئێمە سەقامگیر بکە و کارگوزارەکانمان بۆ ڕێگەی راست ڕێنوێنی بکە. کاتێك نوێژی دەست پێکرد، دوو پەنجە گەورەی خۆی کردە گوێچەکەی و شەش جار تەکبیری وت (هاوشێوەی خەورایج) و دواتر نوێژی خوێند. کاتێك ویستی بڕواتە

سەر مینبەر و وتار بخوێنێتەوە، دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی شمشێر بەدەست لای قادرمەکانی مینبەرەکە دانا تا پارێزگاری لێ بکەن. لەکاتی نوێژیشدا ئەو کارەی کرد چوونکە لەخەڵکی موسڵ دەترسا. دواتر موسڵی بەجێهێشت وچیتر لەو شارە نەمایەوە چوونکە ژمارەی خەڵکەکەی فراوان بوو. ئەو رووی کردە حەدیسە و لەوێ نیشتەجێ بوو.

## سەرەتای کاری ساحەبی زەنج

لەمانگی شەوال/ سێپتامبەر، لەفوراتی بەسرە پیاوێك دەرکەوت کەخۆی بەعەلی کوڕی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی زەید کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەزانی. ئەو زەنگییەکانی (ئەو ڕەش پێستانەی زۆربەیان کۆیلەی بەزێر کراو بون) کەدانیشتووی زەوییە شۆرەکاتەکان بوون، کۆکردەوە و پێشنیاری شوێنکەوتنی پێکردن. (ئەوپیاوێکی عەلەوی و بوێر و بەرێز بوو) لەئێران ڕۆشتە عێراق و منداڵەکانی عەباس حاشایان لەڕەچەڵەکی ئەو کرد لەبەر ئەوەی بناغەی خەلافەتی ئەوانی لەرزاند و لەروخان نزیکی کردەوە. زۆربەی سەردار و راوێژکارەکانی ئێرانی و بزوتنەوەکەی بزوتنەوەیەکی ئێرانی بوو بەلام زۆبەی سوپاییەکانی لەڕەش پێستەکان پێك دەهاتن کەبەناوی بەرابەری نەژادەکان و ئازادی کۆیلەکان ئەوانی کۆکردبوویەوە. دواتر لەدیجلە پەڕییەوە و لەدیناری ئوردووی لێدا.

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: بەو شێوەی وتوویانە ناوی ئەو عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەبدرەحیمە کەپشتی دەگاتەوە بەعەبد قەیس. دایکی ئەو کچی عەلی کوڕی رەحیب کوڕی محەممەد کوڕی حەکیم لەهۆزی ئەسەد کوڕی خوزەیمە لەگوندەکانی شاری ڕەی یە. ئەو دەیوت: باوەگەورێی من محەممەد کوڕی حەکیم لەخەڵکانی کوفە و یەکێك لەشۆڕشگێرەکان دژی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك لەگەڵ عەلی کوڕی زەید کوڕی حسەین بووە. کاتێك زەید کوژرا، ئەویش هەڵات و لەڕەی و لەگوندی وەرزەنین نیشتەجێ بوو. دەیوت: باوەگەورێی عەبدرەحیم پیاوێك لەهۆزی عەبد قەیس بووە و لەتاڵەقان چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و ڕۆشتۆتە عێراق و

کەنیزێکی سندی کڕییەوە و باوکی محەممەد منالْی ئەم کەنیزەیە.

ساحەبی زەنج، پێشتر لەگەلْ دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی مونتەسیر(خەلیفەی عەباسی) لەپەیوەندیدا بوو کەغانەمی شەترەنجی و سەعیدی بچوك لەناو ئەواندا دەبینران. ئەو بەهاوکاری ئەمان و کەسانی خەلیفە ژیانی خۆی دەگوزەراند. ئەو لەهۆنراوەکانی خۆی ئەوانی وەسف دەکرد و بەمشێوەیە پاداشتی لێ وەردەگرتن.

ساحەبی زەنج لەسالْی ٨٦٨/٢٤٩ زایینی لەسامەرا ڕۆشت و رووی کردە بەحرەین و لەوێ بانگەشەی ئەوەی کرد عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی فەزلْ کوڕی حەسەن کوڕی عوبەیداللە کوڕی عەباس کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە. ئەو لەهەجەر[٣١]، خەلْکی بۆ شوێنکەوتنی خۆی هاندا و ژمارەیەکی زۆر لەخەلْکی ئەو ناوچە و ناوچەکانی دیکە پەیوەستی بوون و لەنێوان خەلْکانی هەجەر و بیانییەکان بەهۆی نەژادپەرەستییەوە شەڕ و ئاژاوە کەوتەوە.

خەلْکانی بەحرەین ئەویان لەجێگەی پێغەمبەر(د.خ) دادەنیشاند. ئەو باجی وەردەگرت و فەرمانڕەوایی خەلْکی دەکرد. خۆی و هاوەلاْنی لەگەلْ کارگوزارەکانی خەلافەت جەنگان و ژمارەیەکیان کوشت. دەستەیەك بۆ تۆلْەسەندنەوە هەستان و بۆ کوشتنی ئەو هێزیان کۆکردەوە. ساحەبی زەنج بەناچاری پەنای بۆ ئیحسا برد و لای دەستەیەك لەهۆزی منالْەکانی سەعد کوڕی تەمیم (منالْەکانی شەماس) مایەوە. دەستەیەك لەخەلْکانی بەحرەین لەگەلْیدا دەبینران کەیەحیا کوڕی محەممەدی ئەرزەقی بوحرانی و سلێمان کوڕی جامیع، فرماندەی سوپاکەی ئەو، لەناویاندا دەبینران.

ئەو بەساراکاندا دەگەڕا، لەشوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە دەڕۆشت. لێی دەگێڕنەوە کەوتوویەتی: یەکێك لەنیشانەکانی ئیمامەتی من کەبۆ خەلْکان ئاشکرایە لەو ڕۆژانەی بەساراکاندا دەگەڕام بەمن درا. یەکێك لەوان ئەوە بوو یەکێك لەسورەکانی قورئان بۆ من هاتەخوار و لەیەك سات لەبەرم کرد و کەوتە سەرزمانم. ئەم سورانە لەناویاندا بوون: سبحان، کهف و صاد. یەکێکی دیکە لەنیشانەکانی من ئەوەیە بیرم لەشارێك دەکردەوە تا پەنای بۆ ببەم، چوونکە دەڕۆشتمە هەر

---

[٣١] ناوی پایتەختی بەحرەین بووە. (وەرگێڕ)

شارێك بیٚ هیوا دەبووم. لەم کاتەدا پەڵە هەورێك سێبەری بۆ دروست کردم و پێم وترا: بەرەو بەسرە بڕۆ.

لێی دەگێڕنەوە کە بەخەڵکانی سارانشینی دەوت: لەبەر رووناکی بوونی من عومەری عەلەوی، باوکی حەسەن کە لەکوفە کوژرا، ژیانی بەدەست هێنایەوە. ئەو بەم وتانەی خەڵکانی سارانشینی فریودا و ژمارەیەکی زۆر لەو خەڵکە پەیوەستی بوون. ساحەبی زەنج ئەوانی تا رەدەمی بەحرەین برد و لەویٚ شەڕێکی قورس روویدا و شکستیان خوارد. ساحەبی زەنج هەڵات و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران و عەرەبەکان لەدەروی بڵاو بوونەوە.

کاتێك عەرەبەکان بڵاوەیان لێکرد، رێگەی بەسرەی گرتەبەر و لەنێوان مناڵەکانی زوبەیعە مایەوە و ژمارەیەکی زۆر شوێنی کەوتن کەعەلی کوڕی ئەبانی موهەلبی لەناویاندا دەبینرا. ئەو لە٢٥٤/٨٦٨ زایینی ڕۆشتە ناو بەسرە. ساحەبی زەنج کاتێك ڕۆشتە بەسرە کەمحەممەد کوڕی رەجای حەزاری فەرمانڕەوای شارەکە بوو و ئاژاوەی بەلالییە روویدابوو. لەنێوان بەلالییە و سەعدییە جەنگ کەوتەوە و ئەو چاوەڕوانی سەرکەوتنی یەکێك لەدوو هۆزەکەی دەکرد تا پەیوەستیان ببێت. ئەو کەسی بەدوای ئەم دەستەیە نارد و ئەوانی بۆ پەیوەست بوون بەخۆی هاندا بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. کوڕی رەجا بەدوایدا گەڕا بەڵام هەڵات و کوڕی رەجا دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەوی ئەسیر و زیندانی کرد. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: کوڕ، هاوسەر، کچ و کەنیزەکەی کەدووگیان بوو.

ئەوسا مەبەستی بەغدادی کرد و هاوەڵانی ئەو: محەممەد کوڕی سەلەم و یەحیا کوڕی محەممەد و سلێمان کوڕی جامع و مەرقەسی قورەیعی هاورێیەتیان دەکرد. کاتێك گەیشتە بەتیخە، عومەیر کوڕی عەمار کەجێگری فەرمانڕەوای ئەو دیارە بوو، ئەوانی ناسییەوە. ئەوانی دەستگیر کرد و ڕەوانەی لای محەممەد کوڕی باوکی عەوف فەرمانڕەوای واستی کرد. بەڵام ئەو و هاوەڵانی خۆیان رزگار کرد و بەرەو بەغداد بەرێکەوتن و یەك ساڵ لەویٚ مانەوە. دواتر لەویٚ نەژادێکی بۆ خۆی داتاشی و خۆی بەمحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی زەید ناو برد. لەویٚ بانگەشەی ئەوەی کرد کەکەراماتی هەیە و لەئەندێشە و کرداری هاوەڵانی و هەر

کارێك بیکەن، ئاگادار دەبێتەوە. لەوێ دەستەیەکی شوێن خۆی خست. ئەم کەسانە لەناویاندا دەبینران: جەعفەر کوڕی محەممەدی سوحانی لەمناڵەکانی یەزید کوڕی سوحان، محەممەد کوڕی قاسم، موشرق و رەقیق دوو کۆیلەکەی یەحیا کوڕی عەبدولرەحمان. ئەو نازناوی باوکی ئەحمەدی بەموشرق و نازناوی باوکی فەزڵی بەرەقیق بەخشی.

لەم کاتەدا محەممەد کوڕی رەجا لەفەرمانڕەوایەتی بەسرە دوور خرایەوە و بەلالییە و سەعدییە کەجەنگیان لەگەڵ یەك دەکرد، هەردووك شۆڕشیان کرد و زیندانییەکانی خۆیان ئازاد کرد. لەم ناوەدا زیندانییەکانی دیکە وکەسە نزیکەکانی ساحەبی زەنج لەزیندان رزگاریان بوو. ساحەبی زەنج کاتێك لەهەڵاتنی بنەماڵەکەی ئاگادار بوویەوە، خۆی گەیاندە بەسرە. ئەو لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٢٥٥/ ئۆگۆستی ٨٦٨ زایینی بۆ بەسرە گەڕایەوە و ئەم کەسانەی لەگەڵدا بوون: عەلی کوڕی ئەبان، یەحیا کوڕی محەممەد، سلێمان، موشرق و رەقی. ئەوان گەیشتنە بەسرە و لەکۆشکی قورەشی نزیك رووبارێك بەناوی عەمودی کوڕی مونجەم دابەزین. ئەو بانگەشەی ئەوەی کرد نوێنەری کوڕەکانی واسق (خەلیفەی پێشووی عەباسییە) و بۆ فرۆشی زەوییە سوێرەڵانەکان هاتووە و لەهەمان شوێن مایەوە.

رەیحان کەیەکەم کۆیلەی سورەجبین بوو، دەڵێت: من لەلایەن سەروەرم نوێنەر بووم ئارد بۆ کۆیلەکانی دیکە ببەم. لەناکاو هاوەڵانی ساحەبی زەنج منیان گرت و بردمیانە لای ئەو. فەرمانیان بەمندا هاوشێوەی فەرمانڕەوا سڵاوی لێ بکەم. ئەو کارەم کرد. ساحەبی زەنج پرسی لەکوێوە دێم، وەڵامم دایەوە. سەبارەت بەهەواڵەکانی بەسرە پرسیاری کرد. وتم: بێ ئاگام. سەبارەت بەکۆیلەکانی سورەجبین و بارودۆخی ئەوان پرسیاری کرد. ئەوەی دەمزانی، پێم وت. پێشنیاری شوێنکەوتنی خۆی پێکردم و رازی بووم. وتی: تا ئەو جێگەی دەتوانی کۆیلەکان فریوبدە و ئەوان بێنەرە لای من. بەڵێنی پێدام من دەکاتە فەرماندەی ئەو کەسانەی دەیانبمە لای و سوێندیدام کەس لەشوێنەکەی ئاگادار نەکەمەوە و تەنیا خۆم سەردانی بکەم. دواتر منی بەرەڵا کرد.

بەیانی ئەو رۆژە ڕۆشتمە لای. دەستەیەك لەکرێکارەکان (ئەوانەی گوشراوی

خورمایان هەڵدەگرت) لەماڵەکەیدا بوون. لەسەر پارچەیەکی هەوریشمین ئەم ئایەی نوسیبوو: خواوەند گیان و سامانی باوەڕداران دەکرێت و بەهەشتیان پێ دەدات.[٣٢] ئەم پارچەی لەدارێك بەست و ئاڵایەکی لێ دروست کرد و بەرزی کردەوە. لەهاندانی کۆیلەکانی بەسرە بۆ پەیوەست بوون بەخۆی بەردەوام بوو و ئەوانیش بۆ رزگاری لەداماوی و بەدبەختی پەیوەستی دەبوون. بەم شێوەیە ژمارەی شوێنکەوتەکانی زیادی کرد. قسەی بۆ دەکردن و مژدەی پێ دەبەخشین کەرێبەری بەوان دەسپێرێت و سامانیان پێ دەبەخشێت. سوێندی خوارد هیچ کات فریویان نەدات و جگە لەچاکەکاری لەگەڵ ئەوان بیر لەهیچی دیکە نەکاتەوە. سەروەری ئەم کۆیلانە هاتنە لای و رازی بوون بەوەی بۆ هەر کۆیلەیەك پێنج دینار بدەن و کۆیلەکان ببەنەوە. کۆیلەکان گەورەکانی خۆیان گرت و خستیانە سەرزەوی و ساحەبی زەنج فەرمانیدا کۆیلەکان یەکی پێنسەد قامچییان لێ بدەن. دواتر ئازادیان کردن وبۆ بەسرە گەڕانەوە. لەگەڵ هاوەڵانی سوار چەند کەشتییەك بوون و لەرووباری دوجەیل پەڕینەوە و خۆیان گەیاندە رووباری مەیمون. لەوێ مانەوە. بەردەوام ڕەش پێستەکان لەدەوری کۆدەبوونەوە تا ئەو کاتەی جەژنی رەمەزان هات. لەجەژنی رەمەزان کۆیلەکانی کۆکردەوە و نوێژی لەگەڵ خوێندن و ئاماژەی بەبەدبەختی و چارەڕەشی رابردووی ئەواندا و ئەوەی خواوەند، لەو بەدبەختییانە رزگاری کردوون. دەیوت، دەخوازێت پێگەی ئەوان بەرز بکاتەوە تا ببنە سەروەر و کەڵك لەکۆیلە و سامانەکان وەربگرن.

دوو رۆژ دوای ئەوە حومەیری گەیشت. زەنگییەکان رووبەرووی بوونەوە و پاشەکشێیان پێکرد تا ئەوەی لەرووباری دیجلە دوور کەوتەوە. لەم کاتەدا یەکێك لەفەرمانداندەکان بەنازناوی باوکی سالح، ناسراو بەقەسیر، لەگەڵ سێسەد زەنگی، داوای ئەمانی لەساحەبی زەنج کرد. ساحەبی زەنج کاتێك بینی ژمارەی شوێنکەوتەکانی زیاد بووە، فەرماندەکانی لەخودی ئەوان هەڵبژارد و پێی وتن: هەرکەس لەئێوە کەسێك بێنێت، لەژێر ئاڵا و شوێنکەوتەی خودی ئەو دەبێت.

لەو کاتەدا باوکی عەون لەواست بۆ ئۆبولە و ئاوەدانییەکانی دیجلە

[٣٢] ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم و اموالهم بأن لهم الجنة (توبه، ١١١)

گواستبوویەوە. ساحەبی زەنج مەبەستی موحەممەدییەی کرد و کاتێك لەوێ ئوردووی لێدا، لەناکاو سوپاکەی باوکی عەون هێرشیان کرد. لەم کاتەدا زەنگییەکان هاواریان کرد: شمشێرەکانی خۆتان هەڵگرن. هەمووان هەستان. فەتحی خوێنگیر (ئەوەی بەکەڵە شاخ خوێن دەگرێت) لەناویاندا دەبینرا.

فەتح سەرقاڵی خواردن بوو. کاتێك دوژمنی بینی (دەستی بەشمشێر نەگەیشت) خواردنەکەی بەردەمی هەڵگرت. پیاوێك لەسورەجبین بەناوی بولبول ئەوی بینی و کاتێك فەتحیش ئەوی بینی، پەلاماریدا و خواردنەکەی بۆ هاویشت. بولبول شمشێرەکەی خۆی فرێدا و هەڵات. سوپاکەی باوکی عەون کەچوار هەزار کەس بوون، هەڵاتن. دەستەیەکیان لێ کوژرا و دەستەیەکیان لەتینویەتیدا مردن. ژمارەیەکیان ئەسیر کرا و بەفەرمانی ساحەبی زەنج سەریان بڕین.

دواتر رووی کردە قادسییە و فەرمانی تاڵان کردنی ئەو سەرزەمینەی دەرکرد. بەردەوام هاتوچۆی بۆ رووبارەکانی بەسرە دەکرد.

لەم کاتەدا یەکێك لەڕەشەکان ئاگادار بوویەوە ماڵی یەکێك لەهاشمییەکان لەگەڕەکی سیب، لێوانلێوە لەکەرەستەی جەنگ. ئەوان ماڵەکەیان تاڵان کرد و کەرەستەی جەنگی پێویستیان دەست کەوت. لەم کاتەدا ساحەبی زەنج لەسیب بوو، دەستەیەك لەخەڵکانی بەسرە هێرشیان کردە سەر و رووبەرووی بوونەوە. ئەو یەحیا کوڕی محەممەدی لەگەڵ پێنسەد کەس بۆ جەنگی ئەوان نارد. ئەوان رووبەرووی خەڵکانی بەسرە بوونەوە. خەڵکانی بەسرە شکستیان خوارد و کەرەستەکانی جەنگیان کەوتە دەسی ڕەشەکان. دواتر لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەگوندەکانی جوولەکە (گوندی جولەکە) جەنگان و شکستیان بەوانیش هێنا. ساحەبی زەنج هاوەڵانی لەبیاباندا هێشتەوە.

ساحەبی زەنج دواتر مەبەستی جەعفەرییەی کرد. شمشێری خستە ناویان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و ژمارەیەکی ئەسیر کرد و دواتر ئازادی کردن. بەدوای ئەوە رووبەرووی سوپایەکی گەورە لەخەڵکانی بەسرە بوویەوە کەفەرماندەکەیان ناوی عەقیل بوو. توانی شکستیش بەوان بێنێت و ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژێت. ئەم سوپایە چەندین کەشتی خواردنیان پێ بوو بەڵام بەهۆی

هەڵكردنی با، لەرووبارەكەدا نغرۆ بوون. لەم كاتەدا ڕەشەكان هاتن و هەمو سەرنشینەكانی ناو كەشتییەكانیان كوشت و ئەوەی تیایدا بوو، تالآنیان كرد. فەرماندەی ئەوان كەشتییەكی جیاوازی بوو، سوار كەشتیەكەی بوو و هەڵات. ساحەبی زەنج خۆی پێگەیاند و هەموو سامان و خورادنەكەی لیٚ سەند. دواتر گوندی موهەلبییەی تالآن كرد و سوتاندی.

یەكێك لەسەركردە توركەكان بەناوی باوكی هیلال، لەگەڵ چوار هەزار شەڕكەر لەكەنار رووباری رەیان رووبەرووی ساحەبی زەنج بوویەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. زەنگییەكان هێرشیان كردنەسەر و ئالأدارەكەیان كوشت و بەم شێوەیە باوكی هیلال و سوپاكەی هەڵاتن. زەنگییەكان شوێنیان كەوتن و زیاتر لەهەزار و پێنسەد كەس لەسوپاكەی باوكی هیلالیان كوشت. ژمارەیەكیشان ئەسیر كرد و ساحەبی زەنج فەرمانی سەربڕینی ئەوانی دەركرد.

دواتر ساحەبی زەنج ئاگادار بوویەوە كەزەینەبی (لەمناڵەكانی عەباس) بۆ جەنگی ئەو سوپا ئامادە دەكات و خۆبەخشەكان و هۆزی بیلالییە و سەعدییە كەژمارەیان فراوانە، پەیوەستی بوون تا لەگەڵ ئەوان ڕەشەكان بگرن و زنجیر بكەنە دەست و پێیان. باوكی مەنسور فەرماندەی ئەوانە و موالی هاشمییەكانیش هاوڕێیەتی دەكەن. ساحەبی زەنج، عەلی كوڕی ئەبانی لەگەڵ سەد ڕەش ڕەوانە كرد تا هەواڵە راستەكانی بۆ بێنن. عەلی كوڕی ئەبان رووبەرووی دەستەیەكیان بوویەوە و شكستی پێهێنان و كۆیلەكانی ئەو دەستەیە، پەیوەستی عەلی كوڕی ئەبان بوون.

ساحەبی زەنج دەستەیەكی دیكە لەهاوەڵانی خۆی ڕەوانە كرد. ئەوان گەیشتنە شوێنێك كەهەزار و نۆسەد كەشتی لیٚ بوو و پاسەوانەكان پارێزگارییان لەكەشتییەكان دەكرد. پاسەوانەكان كاتێك ڕەشەكانیان بینی، هەڵاتن. ڕەشەكان هەموو سامانی ناو كەشتییەكانیان تالآن كرد و گەڕانەوە بۆ لای سەروەرەكەیان. كاتێك گەڕانەوە بۆ لای ساحەبی زەنج، ئەو لەسەر زەوییەكی بەرز دانیشت. لەم كەشتیانەدا دەستەیەك بوون دەیانویست لەرێگەی بەسرەوە سەردانی ماڵی خواوەند بكەن. ساحەبی زەنج گفتوگۆی لەگەڵ كردن وئەوان وتەكانی ئەویان

بەراست زانی و وتیان: ئەگەر پارەیەکی زیاترمان پێ بوایە، لەگەڵ تۆ دەماینەوە. ساحەبی زەنج ئەوانی ئازاد کرد. دووبارە دەستەیەکی دیکەی نارد تا هەواڵی دوژمنی بۆ بێنن. ئەوان گەڕانەوە و ئاگاداریان کرد کەسوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو کۆبۆتەوە. فەرمانی بەمحەممەد کوڕی سالم و عەلی کوڕی ئەباندا لەناو دارخورماکان بۆسە بنێنەوە و خۆی لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرز جێگیر بوو. دوای کەمێك ئاڵاکان و سوپاکە دەرکەوت. فەرمانی بەڕەشەکاندا تەکبیر بڵێن و هێرشیان بکەنەسەر. سوپای دوژمن هێرشی کردە سەر ڕەشەکان. ڕەشەکان پاشەکشێیان کرد تا گەیشتنە کێوێك کەساحەبی زەنج لەوێ دانیشتبوو. جارێکی دیکە دوژمن هێرشی کردەوە بەڵام ئەمجارە ڕەشەکان خۆڕاگرییان کرد، فەتحی خوێنگر لەڕەشەکان کوژرا. ڕەشەکان بەهەموو هێزەوە هێرشیان کرد و دەوریان گرتن. محەممەد کوڕی سالم و عەلی کوڕی ئەبان هێرشیان کرد و ژمارەیەکیان لێ کوشتن. بەم شێوەیە سوپاکە هەڵات و ڕەشەکان تا رووباری بیان شوێنیان کەوتن. ئەوان لەزۆنکاوەکان گرفتار بوون و زەنگییەکان ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و ژمارەیەکی زۆریان لەزۆنکاوەندا چەقین.

زەنگییەکان ئاگادار بوونەوە ژمارەیەك لەدوژمەکانیان بۆسەیان ناوەتەوە. بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوتن و بینیان زیاتر لەهەزار مەغربی بۆسەیان داناوە. جەنگێکی قورس لەناو ئەوان دەستی پێکرد. دواتر ڕەشەکان هێرشیان برد و هەموویان کوشتن و کەرەستەکانی جەنگیان کۆکردەوە. ساحەبی زەنج سوپاکەی خۆی ڕەوانە کرد و دووسەد کەشتی ئاردیان بینی و لەگەڵ کەل و پەلەکانی دیکە تاڵانیان کرد. ئەوان موعەلی کوڕی ئەییوبیان تالان کرد. دواتر پێشڕەوی کرد تا گەیشتە پێگەی زەینەبی کەدووسەد سەربازی لێ بوو. ئەوان ڕووبەڕووی ڕەشەکان بوونەوە. ڕەشەکان تا ئەو کاتەی هەموویانیان کوشت، درێژەیان بەجەنگدا. ساحەبی زەنج دواتر گوندی مەیزەرانی تاڵان کرد. لەوێ دەستەیەك لەکۆیلە ڕەشەکانی بینی و لەناو فەرماندەکانی دابەشی کردن. دواتر بەرێکەوت و ڕووبەڕووی شەشسەد شاسوار بەفەرماندەیی سلێمان کوڕی زەینەبی بوویەوە بەڵام سلێمان جەنگی نەکرد. ساحەبی زەنج کەسانێکی نارد تا تاڵانی بکەن. ئەوان

هەرچی گا و مانگا و مەڕیان بینی، لەگەڵ خۆیان هێنایان. ئاژەڵەکانیان سەربڕی و خواردیان. دواتر کەسانێکی نارد تا سامانەکانی دیکە تالآن بکەن.

لەم کاتەدا ساحەبی زەنج ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر. کاتێك گەیشتنە ڕووبەرووی ڕووباری ڕەیاحی، دەستەیەك ڕەش پێست هاتن و پێیان وت لەناو ڕووبارەکەدا درەخششێکیان بینیوە. دوای ماوەیەك ڕەشەکان ئاگادار بوونەوە و هاواریان کرد: کەرەستەی جەنگ، کەرەستەی جەنگ. عەلی کوڕی ئەبان فەرمانیدا سوپاکە بەرەو ئەو شوێنە بڕوات. ئەو لەگەڵ سێسەد سەرباز بەرێکەوت. ساحەبی زەنج پێی وت: هەرکات پێویستت بەهێزی زیاتر بوو، ئاگادارم بکەرەوە. کاتێك عەلی بەرێکەوت، زەنگییەکان هاواریان کرد: کەرەستەی جەنگ، کەرەستەی جەنگ چوونکە لەشوێنێکی دیکەوە ئەو درەوشانەوەیان بینی. محەممەد کوڕی سالم کەسانێکی بۆ ئەو شوێنە ڕەوانە کرد و لەوێ دەستەیەکی بینی و لەنیمەڕۆ تا ئێوارێ بەجەنگ لەگەڵ ئەوان سەرقاڵ بوو. دواتر ڕەشەکان بوێرانە هێرشیان برد و پاشەکشێیان پێکردن. لەخەڵکانی بەسرە و عەرەبەکان نزیکەی پێنسەد کەسیان کوشت و بۆ لای سەروەری خۆیان گەڕانەوە. دواتر عەلی کوڕی ئەبان لەگەڵ هاوەڵانی هات. ئەو شکستی بەدوژمن هێنابوو و ژمارەیەکی لێ کوشتبوون. سەری کوڕی باوکی لەیسی بیلالی قەواریری لەگەورەکانی بیلالییەی هەڵگرتبوو. ساحەبی زەنج بەیانی ئەو ڕۆژە ڕۆشت و ڕێگەی نەدا سوپاکەی بڕواتە ناو شارەکە بەڵام دەستەیەك بۆ ڕۆشتنە ناو شارەکە پەلەیان کرد و خەڵکانی بەسرە لەگەڵ ژمارەیەکی فراوان ڕووبەڕوویان بوونەوە. ساحەبی زەنج ئاگادار بوویەوە. ئەو محەممەد کوڕی سالم و عەلی کوڕی ئەبان و موشرقی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانەی بەسرە کرد. خۆی لەناو سوپاکەدا بوو. ئەوان ڕووبەڕووی خەڵکانی بەسرە بوونەوە. ساحەبی زەنج فەرمانی کشانەوەی بەو دەستەیەدا کە ڕۆشتبوونە ناو بەسرە. ئەوان گەڕانەوە. خەڵکانی بەسرە هێرشیان کردنەسەر و ڕەشەکان هەڵاتن. ئەم پێشهاتە لەکاتی ئێوارێدا ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر لەڕەشەکان کەوتنە ناو ئاو و خنکان. دەستەیەکیان کەوتنە ناو ڕووباری شەیتان. دەستەیەکیان کوژران و پاشماوەکان بڵاوەیان لێکرد. ساحەبی زەنج لێیان جیابوویەوە و بەتەنیا مایەوە و خواوەند

رزگاری کرد.

ساحەبی زەنج کاتێك هاوەڵانی خۆی بینییەوە کە لەنەبوونی ئەو سەرگەردان ببوون. ژمارەی ئەم دەستەیە لەپێنسەد کەس تێپەڕی نەدەکرد. ساحەبی زەنج فەرمانیدا فوو بەکەڕەناکاندا بکەن. پێشتر بەهۆی ئەم دەنگەوە هەموویان کۆدەبوونەوە بەڵام ئەم جارە کەس نەهات. خەڵکانی بەسرەیش ئەو کەشتیانەی ڕەشەکان تاڵانیان کردبوو، ڕفاندیان. کاڵاکانی ئەوانیش لەناو ئەم کەشتییانەدا بوو. بۆ بەیانی ساحەبی زەنج سوپاکەی خۆی بژارد وبینی هەزار پیاو لەدەوری ماوەتەوە. ئەو محەممەد کوڕی سالمی بۆ لای خەڵکانی بەسرە نارد تا ئامۆژگارییان بکات و لەهۆکاری شۆڕشەکەی ئاگاداریان بکاتەوە بەڵام ئەوان محەممەدیان کوشت.

بۆ دووشەممە، چواری زیقەعدە/ پانزەی ئۆکتۆبەر، خەڵکانی بەسرە کەبەسەر ساحەبی زەنج سەرکەوتبوون، پیاوێك بەناوی حەمازی ساجی کەجەنگاوەر و دەریاگەڕ و فەرماندەی خۆبەخشەکان و سنووردااران و شارەزای کەشتی ئاژوتن بوو، وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد. ئەو هێزە خۆبەخشەکان و تیرهاوێژ و دەستەیەك لەعوباد و کەسانی نزیك مزگەوتی هەینی و دەستەیەك لەچاپوك سوارانی بیلالییە و سەعدییە و ئەوکەسانەی خوازیاری جەنگ و جیهاد بوون، کۆکردەوە. سێ کەشتی لەوان پڕ کرد. خەڵك لەتامەزرۆییان بۆ جەنگ لەرێگەی خوادا بەرادەیەك ژمارەیان زیادی کردبوو کەدەستەیەك بەناچاری پیادە ملی ڕێگەیان گرتەبەر.ئەوان کەرەستەی جەنگیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت. دەستەیەکیان بوونە پێشەنگ و پاسەوانی ڕێگەیان دەکرد. ئەوان لەکاتی هەڵکشانی ئاو دەهاتنە ناو کەشتییەکان و پیادەکان لەکەنارەکان دەمانەوە.

کاتێك ساحەبی زەنج ئاگادار بوویەوە، دەستەیەك لەسوپاکەی بەفەرماندەیی زورەیقی ئیسبەهانی لەرۆژهەڵاتی رووبارەکە و دەستەیەکی بەفەرماندەیی شیبل و حسەینی حومامی لەرۆژهەڵاتی رووبارەکە نارد بۆ ئەوەی بۆسە بنێنەوە. فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەباندا رووبەرووی خەڵکانی بەسرە ببێتەوە و خۆی و هاوەڵانی روخساریان لەپشت قەڵغانەکان شاردەوە و شەڕیان نەکرد تا بەدوژمن بگەن.

فەرمانی بەو کەسانەدابوو کەبۆسەیان نابوویەوە ئەو کاتە لەشوێنەکانی خۆیان بێنەدەر کەخەڵکانی بەسرە لایانەوە گوزەر دەکەن. ساحەبی زەنج لەگەڵ ژمارەیەکەی کەم لەسوپاکەی مایەوە. ژمارەی زۆری سوپاکەی بەسرە، ساحەبی زنجی ترساند. سوپاکەی رووبەرووی خەڵکانی بەسرە بوونەوە. ئەوانەی بۆسەیان دانابوو، لەهەردوو لای رووبار و لەپشت کەشتییەکانەوە هێرشیان کردە سەرپیادەکان. دەستەیەك نغرۆ بوون و ژمارەیەکی زۆریان کوشت. پاشماوەکان بەرەو رووبارەکە رایان دەکرد لەکاتێکدا بارانی شمشێر بەسەریاندا دەباری. هەرکەس خۆڕاگری دەکرد، دەکوژرا و هەرکەس خۆی دەخستە ناو ئاوەکە دەخنکا. زۆرینەی ئەم سوپایە کوژران و کەسێك جگە لەئاوارەکان رزگاری نەبوو. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی بەسرە بێ سەرەو شوێن بوون و هاواری گریان بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە. خەڵکان ئەم رۆژەیان بە(بیدا)[٣٣] ناو برد و بەرۆژێکی کارەساتبار دەزانی.

دەستەیەك لەمناڵەکانی هاشم وخەڵکانێکی زۆر لەم رۆژەدا کوژران. سەری ئەوانیان لای ساحەبی زەنج کۆکردەوە. کەسانی ئەم کوژراوانە هاتنە لای. هەرکەس سەری کوژراوەکەی خۆی دەناسییەوە، ساحەبی زەنج بۆی دەگەڕاندەوە. چەندین سەریش کەس خاوەنی نەبوو. ساحەبی زەنج فەرمانیدا بیانخەنە ناو ئاو. ئاو، سەری کوژراوەکانی بردە بەسرە و خەڵکان دەڕۆشتن و سەرەکانیان لەئاوەکان دەگرتەوە. ساحەبی زەنج چیتر هێزی زیادی کرد و پێگەی بەرز بوویەوە. خەڵکانی بەسرە ترسی ئەویان کەوتە دڵ و دەستیان لەجەنگ لەگەڵ ئەو هەڵگرت.

خەڵك هەواڵی ئەم جەنگەیان بۆ خەلیفە نووسی. ئەو جەعلانی تورکی لەگەڵ سوپایەك بۆ هاوکاری ئەوان نارد و باوکی ئەحوەسی باهلی وەك فەرمانڕەوای ئوبولە بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد و فەرماندەیەکی تورکی بەناوی جورەیح بۆ هاوکاری ئەوان نارد. بەڵام ساحەبی زەنج لەکۆتایی رۆژ ڕێگەی زەوییە سوێرەکانی قوڕەی گرتەبەر و سوپاکەی خۆی بۆ تالانی بۆ رۆژهەڵات و رۆژئاوا ڕەوانە کرد. ئەمە بەسەرهاتی ئەو لەم ساڵەدا بوو.

---

٣٣ کوڕی ئەسیر رۆژی بیدای هێناوە و بەمانای سارایە و تەبەری رۆژی شذای هێناوە و بەمانای تیرهاویشتنە و ئەمەیان راستتر بەرچاو دەکەوێت. وەرگێڕ)

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا لەنێوان خەلیفە و موساوری، شەڕ ڕوویدا و لەکۆتاییدا سوپای خەلیفە شکستی خوارد.

لەم ساڵەدا موعەلی کوڕی ئەییوب مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ فەوریە، سیلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر فەرمانڕەوایی بەغداد و سوادی عێراقی گرتەدەست. ئەو لەم ساڵەدا هاتبووە خوراسان. هاتە بارەگای موعتەز و موعتەز خەلاّتی پێبەخشی و لەسامەراوە بەرەو بەغداد بەرێکەوت. کوڕی ڕۆحی ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

من عذيرى الخلائق ضلوا — فى سليمان عن سواء السبيل

عوضوه بعد الهزيمة، بغدا — ذكان قد اتى بفتح جليل

من يخوض الردى اذا كان من فـــ — رةوانة اثابوه بالجزاء الجميل

واتاکەی: هاورێ من کێیە تا من لەم خەڵکە گومڕایە کەسەبارەت بەسلێمان ڕێگەی خۆی ون کردووە، ڕزگار بکات.

خەڵك پاداشتی هەلاّتنی ئەویان لەفەرمانڕەوایەتی بەغداد داوە، دەڵێی کارێکی گەورەی کردووە (لەڕووداوی تەبەرستان لەحەسەن کوڕی زەید هەلاّت و مازەندەرانی بەو سپارد. کاتێك براکەی محەممەد لەبەغداد کۆچی دوای کرد، ئەویان کردە جێگری براکەی).

کێیە دوای ئەم نەنگە بتوانێت لەدەریای مەرگ بدات لەکاتێدا پاداشتی هەلاّتن و نەنگ، پاداشتێکی گەورەی لەم شێوەیە بێت.

(نوسەر دەڵێت) یانی هەلاّتنی سلێمان لەبەرابەر حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی وەسیف، ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل و حەسەن کوڕی مەخلەد و باوکی نوح عیسا کوڕی ئیبراهیمی گرت و زیندانی کردن و داوای سامانی ئەوانی دەکرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو تورکەکان داوای مانگانەی خۆیان دەکرد. ساڵح بەموعتەزی وت: ئەوان داوای مانگانەی خۆیان دەکەن و هیچ پارەیەك لەگەنجینەدا

نییە و کاربەدەستەکان هەموو پارەکانیان فڕاندووە. ئەحمەد وەزیری موعتەز و حەسەن وەزیری دایکی موعتەز. ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل پێی وت: ئەی یاخی زادەی یاخی، جوێنیان بەیەکدا تا ئەو جێگەی سالح بێهۆش کەوتە سەرزەوی.

ئەم هەواڵە بەگوێی هاوەڵانی سالح گەیشت کە لەبەردەرگا وەستابوون. هەموویان دەنگیان بەرز کردەوە و شمشێریان دەرکێشا و هێرشیان کردە سەر موعتەز. موعتەز گرنگی پێنەدان و ڕۆشتە ژوورەکەی خۆی. سالح، ئەحمەد کوڕی ئیسرائیل و کوڕی مەخلەد و عیسای گرت و بەزنجیر ئەوانی بەستەوە ولەگەڵ خۆی بردنی. موعتەز پێش ڕۆشتن بەسالحی وت: ئەحمەد بەمن ببەخشە چوونکە راوێژکار و راهێنەری منە بەلام سالح رازی نەبوو و قامچی بارانی کردن و بەڵێنی لێ وەرگرتن تا برە پارەیەکی زۆر قیست قیست بدەن بەلام نەیتوانی هیچیان لێ نەسەندن و جەعفەر کوڕی مەحمود وەك وەزیر دیاریکرا.

لەرەجەب/ ژووەنی ئەم ساڵە عیسا کوڕی جەعفەری حەسەنی و عەلی کوڕی زەیدی حەسەنی لەکوفە شۆڕشیان کرد و عەبدولله کوڕی محەممەد کوڕی داود کوڕی عیسا( فەرمانڕەوای عەباسی) کوفەیان کوشت.

لەزیقەعدە/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە، حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی باوکی شواربی قازی خرایە زیندان و لەمانگی زیحەججە/ نۆڤەمبەر عەبدولرەحمان کوڕی نائیلی بەسرەی وەك قازی سامەرا دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدولله کوڕی عەباس، ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا پیاوێکی عەلەوی لەمیسر دەرکەوت بەناوی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولله کوڕی ئیبراهیم کوڕی تەباتەبا. ئەو لەنێوان بەرەقە وئەسکەندەرییە دەرکەوت و رووی کردە سوعەید و شوێنکەوتەکانی فراوان بوون. بانگەشەی خەلافەتی کرد وئەحمەد کوڕی تولون سوپایەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد و شکستی پێهێنا و شوێنکەوتەکانی بلاوەیان لێکرد. خۆی خۆڕاگری کرد بەلام سەرئەنجام کوژرا و سەری براوی ئەویان بۆ میسر نارد.

لەم ساڵەدا خەفاجە کوڕی سوفیان، فەرمانڕەوای سیسیل (سەقەلییە) لەمانگی

ڕەجەب/ ژوئەن مرد و دوای ئەو کوڕەکەی، محەممەد لەسەر تەخت دانیشت و چەند و چۆنی ئەم ڕووداوەمان لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٨٦١/٢٤٧ زایینی باس کرد. کاتێك محەممەد هاتەسەر کار، مامی، عەبدوللە کوڕی سوفیانی بۆ جەنگی ساراگوزار ڕەوانە کرد. عەبدوللە زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەم دیارەی لەناو برد.

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد عومەر کوڕی شیمر کوڕی حەمدویەی هیرەوی کەزانای هۆنراوە و ئەدەب و لەکوڕی ئەعرابی و ریاشی و کەسانی دیکە حەدیسی دەگێڕایەوە، مرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی کەرام کوڕی عەراف کوڕی خەزانە کوڕی بەرا، پێشوای دینی بەناوبانگی هاوشێوەگەری (تشبیە، باوەڕ بەوێنا کردنی خواوەند کەچاو و دەستی هەیە و دەستی خوا بەراستی دەزانێت نەك خوازراو) لەشاری شام چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو سیستانی بوو.

لەم ساڵەدا زوبەیر کوڕی بوکار کوڕی عەبدوللە کوڕی موسعەب کوڕی سابت کوڕی عەبدوللە کوڕی زوبەیر، قازی مەککە، لەبان کەوتە خوار و دوای دوو ڕۆژ لەتەمەنی هەشتا و چوار ساڵی مرد.

عەبدوللە کوڕی عەبدولرەحمانی دارمی، خاوەنی (مسند) (( کتێبی مسند لەحەدیس) لەزیحەججە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە لەتەمەنی حەفتا و پێنج ساڵی مرد.

باوکی عیمران عەمرۆ کوڕی بەحری جاحز، لەوتاردەرەکانی موعتەزیلە، عەلی کوڕی موسەنا کوڕی یەحیا کوڕی عیسای موسڵی باوکی ئەبو لەعلی، (خاوەندی مسند) لەم ساڵەدا کۆچی دواییان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەدی سوحنونی فەقیهی قیروانی لەقیروان کۆچی دوایی کرد.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی یازدەیەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٢

# پێرست

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و شەشی کۆچی (٨٧٠ زایینی)

**گەیشتنی موسا کوڕی بوغا بۆ سامەرا و خۆشاردنەوەی ساڵح**

لەدوانزەی موحەرەم، بیست و یەکی دێسامبەری ئەم ساڵە، موسای کوڕی بوغا بەسوپای ئامادە بۆ جەنگ هاتە ناو سامەرا. ساڵح کوڕی وەسیف خۆی شاردەوە و موسا یەکڕاست بەرەو کۆشکی خەلیفە بەرێکەوت. موهتەدی (خەلیفە) بۆ بیستنی سکاڵای خەڵکان دانیشتبوو و دادی ئەوانی وەردەگرت. ئەویان لەهاتنی موسا ئاگادار کردەوە. خەلیفە بۆ ماوەی کاژێرێك مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووری بەموسا نەدا. دواتر مۆڵەتی بەخۆی و هاوەڵانیدا. ئەوان ڕۆشتنە ژوور و بەزمانی تورکی لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد و دواتر موهتەدییان لەسەر جێگەکەی هەڵگرت و لەسەر چوارپایەکی تایبەت بەنۆکەرەکان دایشانیشاند. هەموو سامانی ناو کۆشکەکەیان تالاّن کرد و موهتەدییان بۆ ماڵی یاجور برد.

هۆکاری گرتنەکەی بەو شێوەیەی یەکێك لەوان ئاماژەی پێداوە، ئەمەیە: موهتەدییان بۆیە گرت چوونکە وتیان مۆڵەت نەدانی ئەو مەبەستێکی لەپشتەوەیە بۆ ئەوەی ساڵح کوڕی وەسیف بەسوپاکەی خۆی سەرکوتان بکات. لەبەر ئەمە ترسان و ئەویان بۆ شوێنێکی دیکە برد. کاتێك موهتەدییان گرت، بەموسا کوڕی بوغای وت: لەخوا بترسە، هاوار لەتۆ چوونکە کارێکی نەشیاوت کرد. موسا پێی وت: سوێند بەگۆڕی متوەکیل و واسق ئێمە تەنیا باشەی تۆمان دەوێت. موسا هەرکات مەبەستی ئەنجامدانی کارێکی چاکەی ببووایە، سوێندی بەگۆڕی ئەو دووانە دەخوارد. دواتر پەیمانیان لێ سەند نەبێتە شوێنکەوتەی ساڵح و جگەی لەوەی لای ئەوان دەیدرکێنێت، هیچ لەدڵدا نەشارێتەوە. دواتر دووبارە بەیعەتیان لەگەڵ کرد و شەویان کردە بەیانی. پەیکیان بۆ لای ساڵح نارد تا خۆی ئاشکرا بکات. داوای خوێنبایی سکرتێر و سامانی موعتەز و کەسانی نزیکی موعتەزیان لێکرد. ساڵح بەڵێنیدا ئەو بڕە پارەیە دەدات. بەلاّم کاتێك شەو داهات، هاوەڵانی

ساڵح بڵاوەیان لێکرد و تەنیا چەند کەس لەگەڵ ئەو مابوونەوە. بەمشێوەیە بەناچاری هەڵات و خۆی شاردەوە.

## چۆنیەتی کوژرانی ساڵح کوڕی وەسیف

لەبیست و دووی سەفەر/ سی ژانویەی ئەم ساڵە، ساڵح کوڕی وەسیف کوژرا.

هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بوو موهتەدی لەبیست و حەوتی موحەڕەم/ شەشی ژانویە نامەیەکی ئاشکرا کرد و بانگەشەی ئەوەی کرد ژنێك ئەم نامەی بەسیمای شەرابی سپاردووە و پێی وتووە: لەم نامەیە ئامۆژگارییەك شاراوەیە و ئەوەی ماڵی ئەو لەفلانە گەڕەکە و هەرکات خوازیاری بینینی ئەو بن، لەبەردەست دەبێت. بەدوای ژنەکەدا گەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە. سیمای شەرابی وتی: نازانێت کێ ئەو نامەی هەڵداوەتە ناو ماڵەکە.

موهتەدی سەرکردەکان و سلێمان کوڕی وەهبی بانگ کرد و نامەکەی نیشاندان.

سلێمان گومانی وابوو نامەکە دەستنووسی ساڵحە. موهتەدی نامەی بۆ سەرکردەکان خوێندەوە. لەو نامەدا نوسرابوو (نوسەر) لەسامەرا خۆی شاردۆتەوە و بۆ تەندروستی و مانەوەی موالی (کۆیلەکان و تورکەکان) و کوێر کردنەوەی چاوی ئاژاوە، خۆی حەشار داوە. ئەو هۆکاری یاخیبوونەکەی باس کردبوو کەشایەتی بوو بۆ دڵپری ئەو. کاتێك کۆتاییان بەخوێندنەوەی نامەکەی هێنا، موهتەدی داوای ئاستی و سازانی لێکردن و ڕێگەی ناسازگاری و دوژمنایەتی لێگرتن. تورکەکان گومانیان کرد جێگەی ساڵح دەزانێت و خوازیاری پەیوەست بوون بەوە. موهتەدی و تورکەکان زۆریان قسە کرد.

بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە تورکەکان لەبەردەم ماڵی موسا کوڕی بوغا کۆبوونەوە. ڕۆشتنە ناو کۆشك و بڕیاری لەسەر کار لابردنی موهتەدییاندا. بابەکیال پێی وتن: ئێوە منالی متوەکیل (موعتەزتان) کوشت. ئەو هەم جوان بوو هەم بەخشندە و چاکەکار، ئێستا دەتانەوێت خوێنی موهتەدی بڕێژن. ئەو موسوڵمانێکە کە بەڕۆژوو دەبێت و ناخواتەوە و هیچ گوناحێکی نییە. سوێند بەخوا ئەگەر بیکوژن،

دەڕۆمە خوراسان و تەپڵی ریسوایی ئێوە لێ دەدەم.

کاتێك موهتەدی لەم کۆبوونەوەیە ئاگادار بوویەوە، لەشوێنەکەی هەستا و شمشێری هەڵگرت، جل و بەرگی خاوێنی پۆشی و بۆنی خۆشی لەخۆیدا (بۆ مردن خۆی ئامادە کرد) دواتر فەرمانیدا ئەوان بڕۆنە لای. ئەوان هاتن، پێی وتن: لەمەبەستەکەی ئێوە ئاگادارم، من هاوشێوەی پێشینانی خۆم نیم (موستەعین و موعتەز)، سوێند بەخوا هەنووکە کە لەبەردەم ئێوە وەستاوم بۆنی خۆشم لەخۆم داوە و منداڵەکانم بەبراکەم سپاردووە، ئەمە شمشێرەکەی منە و سوێند بەخوا تا دەسکی شمشێرم لەدەستا بێت، دەجەنگم. سوێند بەخوا ئەگەر یەك تاڵە موو لەسەری من کەم ببێتەوە، زۆربەی ئێوە لەخوێنی خۆتاندا دەگەوزێنم. ناسازگاری لەگەڵ خەلیفەکان و شۆڕش و کوشتنی ئەوان تاکەی؟ لەروانگەی ئێوەدا یەکسانن ئەو کەسانەی بۆ مانەوەی ئێوە تێدەکۆشن و ئەو کەسانەی دەخۆنەوە و لەو زیانەی بەسەر ئێوەدا داباریوە، رەزامەندن و لەوەی لەدنیای ئێوە فڕاندوویانە،، کەڵك دەبن، هەنووکە بزانن دەستەیەك لەوکەسانەی پەیوەندییان لەگەڵ ئێوەدا هەیە لەبنەماڵە و منداڵەکانی من بۆ ئێوە خراپەخوازتر و ڕەشبینترن و بەردەوام دەڵێن: من لەشوێنی خۆشاردنەوەی ساڵح ئاگادارم، مەگەر ئەو یەکێك لەمواليیەکان(هاوشێوەی ئێوە)نییە؟ کەواتە ئەگەر بۆچوونی ئێوە سەبارەت بەو هەڵە بێت، چۆن دەتوانم لای ئەو بژیم. ئەگەر ڕێگەی سازان بگرنەبەر، ئەو ڕێگەیە کەخوازیارم پێی و ئەگەر ڕێگەیەکی جیاواز هەڵدەبژێرن، خۆتان دەزانن و بەدوای ساڵحدا بگەڕێن چوونکە لەشوێنی خۆشاردنەوەی ئەو ئاگادار نیم.

وتیان: سوێند بخۆ. وتی: ئەگەر بخوازن، سوێند دەخۆم بەڵام دەبێت لای منداڵەکانی هاشم بێت. قازییەکانیش دەبێت شایەتی بدەن و سوێند خواردنەکەیش بەیانی، رۆژی هەینی و دوای نوێژی هەینی دەبێت. دواتر بەبابەکیال و محەممەد کوڕی بوغای وت: ئێوە بوون و بینیتان ساڵح چی لەگەڵ سکرتێرەکان کرد و چۆن سامانی ئەوانی فڕاند و چ بەڵایەکی بەسەر دایکی موعتەزدا هێنا. ئەگەر دەستی بەسەر سامانێکدا گرت، ئێوەیش ئەو کارەتان کرد. ئەم دوانە بەو وتەیە ڕق و کینی ئەویان لەدڵ گرت و مەبەستی دوورخستنەوەی ئەویان لەخەلافەت کرد بەڵام

ترسان شۆرش دروست ببێت. لەلایەکی دیکە بڕە پارەیەکی کەم لەناو گەنجینەدا دەبینرا. لەم کاتەدا دە هەزار هەزار درهەم و پێنسەد هەزار درهەم لەفارسەوە گەیشت و لەکۆتایی موحەرەم/ نۆی ژانویە ئەم وتەیە کەوتە سەرزاران کەموالییەکان یەکیان گرتووە بۆ ئەوەی خەلیفە لەسەر کار لاببەن و خوێنی برێژن. ئەوان موهتەدییان بێزار کردبوو. لەبەر ئەمە خەڵکان شەو نامەیان دەنووسی و لەرێگەکاندا بلاّویان دەکردەوە یا فڕیان دەدایە ناو مزگەوتەکان. لەم نامانەدا نووسرابوو: ئەی موسوڵمانەکان! بۆ خەلیفەی دادپەروەری خۆتان کەهەموان لێی رازی و هاوشێوەی عومەر کوڕی خەتابە، بپارێنەوە تا خواوەند سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانی پێ ببەخشێت و شەڕی ستەمکاران کەم بکاتەوە و پێگەی خۆی بەتەواوی بۆ بگەڕێتەوە و ئەو بۆ ئەم ئۆمەتە بهێڵێتەوە. تورکەکان ناچاریان کردووە دەست لەخەلافەت هەڵگرێت ئەو چەندین رۆژە لەڕەنجدایە. سلاّوی خواوەند لە پێغەمبەر(د.خ) بێت. لەچوارشەممە چواری سەفەر/ دوانزەی ژانویە، موالّیییەکان( تورکەکان) لەکەرخ و کەنارەکان کەوتنە جموجۆڵ. پەیکیان بۆ لای موهتەدی نارد و داوایان لێکرد یەکێك لەبراکانی بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکات. موالییەکان بەباوکی قاسمیان وت کەملکەچی فەرمانەکانی موهتەدین و ئاگادار بوونەتەوە کەموسا و بابەکیال و دەستەیەك لەهاوەلاّنی ئەوان ئەندێشەی دوورخستنەوەی موهتەدییان لەسەردایە و ئەوان خوێنی خۆیان لەپاڵ موهتەدی دەرێژن. ئەوان لەدواکەوتنی مانگانەی خۆیان سکالاّیان کرد و وتیان: ماڵیات و کرێی ئەو زەوییانەی بەوان سپێردراوە و دەبێت بەسەرکردە و فەرماندەکانی بدەن، زۆر زیادە. سکالاّیان لەزۆری ئەو باج و خەراجە کرد کەدەبێت بەگەورەکانی خۆیان بدەن و وتیان ژن و منالّەکانی ئەوان زیادی کردووە و تواناى بەخێو کردنی ئەوانیان نییە. ئەوان ئەم قسانەیان نووسی. باوکی قاسم نامەی ئەوانی بەدەستی موهتەدی گەیاند. موهتەدی بەخەتی خۆی ئەم وەلاّمەی دانەوە. نامەی ئێوەم خوێندەوە و لەفەرمانبەری ئێوە شادمانم، خواوەند پاداشتی چاکەتان بداتەوە.ئەوەی لەهاورێیەتی و نیازەکانتان ئاماژەتان پێداوە، بۆ من دژوارە. سوێند بەخوا حەزم دەکرد نیاز و داواکارییەکانی ئێوە بەبەهای ئەوەی من نەخۆم

و نەخۆمەوە و تەنیا ڕۆژییەکی کەمی ماڵ و منداڵەکەم دابین و بکەم و شەرمی خۆمی پێ داپۆشم، دابین بکرێت. ئێوە ئاگادارن لەو برە پارەی گەشتۆتە گەنجینە، لێپرسینەوە لەزەویی و شتەکانی دیکە دەکەم و بەخواستی خواوەند، لەرێگەی هاورێیەتی ئێوە خەرجی دەکەم.

ئەوان ئەم نامەیان خوێندەوە و دوای پاڕانەوە نامەیان بۆ نووسی تا کارە گشتی و تایبەتەکان بەسەروەری باوەڕداران بسپێردرێت و کەس بۆ هیچ شتێك ناچاری نەکات و نەریت و ری و رەسمەکان هاوشێوەی رۆژگاری موستەعین بێت. لەسەر ئەم بنەمایە کەهەر نۆ سەربازێك سەرکردەیەك و هەر پەنجا سەرباز جێگرێك و هەرسەد سەرباز، سەردارێك. رۆژانەی ژنان و زیادەکان لەدەفتەری سەربازەکان هەڵبگیرێت و هیچ سەربازێك (موالی) دەستدرێژی نەکاتە سەر سامانی خۆی و کەسانی دیکە.

دواتر وتیان: ئەوان خۆیان دەڕۆنە بارەگای خەلیفە تا خۆی نیازەکانیان بەراوەردە بکات و ئەگەر ئاگادار ببنەوە کەسێك لێپرسینەوەی لەگەڵ خەلیفە کردووە، سەری لەجەستە جیا دەکەنەوە و ئەگەر یەك موو لەجەستەی سەروەری باوەڕداران کەم ببێتەوە، موسا کوڕی بوغا و بابەکیال و یاجور و هاوپەیمانەکانی ئەوان دەکوژن.

ئەوان ئەم نامەیان تەسلیم بەباوکی قاسم کرد و خۆیان بەرەو سامەرا بەرێکەوتن. سەرکردەکان کەوتنە خۆ. موهتەدی خۆی بۆ داوەری کردن دادەنیشت و فەقیە و قازییەکان ئامادە دەبوون. فەرماندەکان هەرکام لەشوێنی خۆیاندا بوون. باوکی قاسم نامەکەی هێنا. موهتەدی بەدەنگی بەرز نامەکەی خوێندەوە. موسا کوڕی بوغا لەناو ئامادە بوواندا بوو. خەلیفە وەڵامی نامەکەی بەخەتی خۆی دایەوە و بەداواکارییەکانیان رازی بوو. نامەکەی بەباوکی قاسمدا. باوکی قاسم بەموسا کوڕی بوغا و بابەکیال و محەممەد کوڕی بوغای وت: لەگەڵ من چەند کەسێك وەك نوێنەر ڕەوانە بکەن تا داوای بەخشین لەوان بکەن. ئەوان چەند کەسێکیان نارد. گەیشتنە لای تورکەکان. ژمارەی سوارەکانیان نزیکەی هەزار کەس و پیادەکانیان سێ هەزار کەس بوو. ئەم پێشهاتە لەپێنجی سەفەر/ سیانزەی

ژانویە روویدا. باوکی قاسم نامەکەی پێدان و وتی: سەروەری باوەڕداران بەداواکارییەکانی ئێوە رازی بووە و دواتر وتی: ئەوانە نوێنەری سەرکردەکانی ئێوەن و دەخوازین ئەگەر هەواڵێك لەوان بەئێوە گەیشتووە، داوای لێبوردن بکەن، ئەوان دەڵێن: ئێوە بران، ئێوە لەئێمەن و بەردەوام لەگەڵ ئێمەن. لەزمانی سەرکردەکانەوە داوای بەخشینی کرد.

ئەوان دوای ئەوە نامەیەکیان بۆ موهتەدی نوسی و داوای پێنج وەفدیان لێکرد: وەفدێك بۆ کەم کردنەوەی زیادییەکان، وەفدێك بۆ وەرگرتنەوەی زەوییە تایبەتەکان، وەفدێك بۆ جیاکردنەوەی موالییەکان و لەپێشی بەخشین بەکەسە تایبەتەکان لەچاو بیانییەکان، وەفدێك بۆ ئەوەی رێ و رەسمەکان بۆ رۆژگاری موستەعین بگەڕێتەوە و و وەفدێك بۆ ئاڵ و گۆڕ کردنی ئەسیرەکان و ئەوەی سەروەری باوەڕداران سوپا بەیەکێك لەبراکانی خۆی یا هەر کەسێکی دیکەی هەڵبژێردراوی خۆی بسپێرێت تا لەنێوان ئەو و ئەوان وەك پەیکێك وابێت. ئەم کەسە نابێت لەموالییەکان هەڵبژێردرێت. لێکۆڵینەوە لەسامانی ساڵح کوڕی وەسیف و موسا کوڕی بوغا بکرێت و بۆ ئەوانیش مانگانە دیاری بکرێت. وتیان تەنیا بەبەدیهێنانی ئەم داواکارییانە شادمان دەبن. نامەکەیان بەباوکی قاسم سپارد و نامەیەکی دیکەیان بۆ سەرکردەکانی وەك موسا و کەسانی دیکە نارد کەنامەیەکی لەو شێوەیان بۆ سەروەری باوەڕدران نووسیوە. داوایان لەموهتەدی کرد نابێت هیچ یەك لەو شتانەی داوایان کردووە، درێغی بکات مەگەر ئەوەی لەگەڵ خۆیان راوێژ بکات و ئەگەر ئەو کارە بکات، رازی نابن بەهەمان شێوە ئەگەر چقڵێك قاچی سەروەری باوەڕداران بریندار بکات یا تاڵێك موو لەسەری کەم ببێتەوە، سەرکردەکان دەکوژن و ئەوەی کەرازی نابن تا ئەو کاتەی ساڵح خۆی ئاشکرا دەکات و ئەو لەگەڵ موسا کوڕی بوغا بگرن بۆ ئەوەی بزان سامانەکان لەکوێیە. کاتێك موهتەدی نامەی ئەوانی خوێندەوە، فەرمانیدا پێنج وەفد وەك ئەوەی داوایان کردبوو، ڕەوانە بکەن. ئەم وەفدانە لەکاتی ئاوابوونی هەتاو لەگەڵ باوکی قاسم ڕەوانە کران و بەهەموو داواکانی ئەوان رازی بوو. موسا کوڕی بوغایش رازی بوونی خۆی دەربڕی و بۆ ئەوانی نارد و مۆڵەتیدا ساڵح خۆی

ئاشکرا بکات. ئەو نووسی کەساڵح برا و کوڕە مامی ئەوە و ناخوازێت (ساڵح) کارێك بکات کەتورکەکان پەسەندی ناکەن. کاتێك تورکەکان نامەی ئەویان خوێندەوە، وتیان: هەنووکە شەو داهاتووە، بەیانی ئێوە لەبۆچوونی خۆمان ئاگادار دەکەینەوە. ئەمەیان وت و بڵاوەیان لێکرد. بۆ بەیانی موسا لەکۆشکی خەلیفەوە لەگەڵ هەزار و پێنسەد کەس بەرێکەوت و دەوری گرتن. باوکی قاسم گەیشت بێ ئەوەی وەڵامێکی شیاوی لەوان وەرگرتبێت. هەردەستە و شتێکی دەهێنایە سەرزمان، کاتێك قسەکان درێژەی کێشا، باوکی قاسم لەسوپاکەی موسا گوزەری کرد و گەڕایەوە. موسا کوڕی بوغایش ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.

دواتر موهتەدی، فەرمانی بەمحەممەد کوڕی بوغادا لەگەڵ برای خەلیفە بڕواتە لای تورکەکان. ئەو لەگەڵ پێنسەد سوار بەرێکەوت. موسا گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی بەیانی لێوەی هاتبوو. باوکی قاسم و محەممەد کوڕی بوغا ڕۆشتن تا تێکەڵ بوون و ئەوان دەوریان گرتن. باوکی قاسم و محەممەد نامەکەیان تەسلیم کرد کەتیایدا ئەمان بەساڵح کوڕی وەسیف بەخشرابوو. ئەوان داوایان کرد موسا کوڕی بوغا پێگەکەی وپلەی باوکی بگرێتەدەست و ساڵح کوڕی وەسیفیش بەهەمان شێوە. سوپا لەدەستی کەسێکدا بێت کەهەنووکە لەدەستی ئەودایە، ساڵح کوڕی وەسیف لەحەشارگەکەی بێتەدەر و ڕۆژانەی ئەوان بدرێت. لێرەوە ناسازگاری ڕوویدا. دەستەیەك ڕازی و دەستەیەك نارازی بوون. باوکی قاسم و محەممەد کوڕی بوغا لەم بارودۆخەدا گەڕانەوە و خەڵکان لەکەرخ و دور[1] وسامەرا بڵاو بوونەوە.

بۆ بەیانی مناڵەکانی وەسیف لەگەڵ دەستەیەك سوار بوون و هاواری (کەرەستەی جەنگیان)) بەرز کردەوە. چوارپێکانیان فڕاند و لەسامەرا ئوردوویان لێدا. پێداگرییان لەباوکی قاسم کرد و داوای ساڵح یان دەکرد. موهتەدی هەواڵی ئەم شۆڕشەی بیست. ئەو بەموسای وت: ئەوان خوازیاری ساڵحن. موسا وتی: مەگەر من ئەوم شاردۆتەوە. ئەگەر ئەو لای تورکەکان بێت، دەبێت ئازادی بکەن بۆ

---

[1] دور: ناوی حەوت ناوچەیە لەعێراق، لەناوچەکانی بەغداد وەك دوری تکریت و سامەرا. هەروەها لەنزیك دودەیل گوندێك هەیە بەناوی دوری مناڵەکانی ئەوقەر، هەروەها ناوی گوندێکە لەسەمیسات. معجم البلدان.

ئەوەی خۆی ئاشکرا بکات.

لەم کاتەدا موسا و سەرکردەکان سوار بوون و خەڵکان لەدەوریان کۆبوونەوە. ژمارەی سوارەکانی ئوردووگاکەی چوار هەزار کەس بوو. ئەوان ئوردوویان لێدا و تورکەکان بلاوەیان لێکرد. لەم رۆژەدا هیچ جموجۆڵێك لەدانیشتوانی کەرخ و دور نەبینرا. موسا و هاوەلانی بۆ دۆزینەوەی سالح کوڕی وەسیف هەوڵیان دەدا و گومانیان لەدەستەیەك کرد لەوەی سالحیان شاردبێتەوە بەلام لای ئەوان نەدۆزرایەوە.

دواتر کۆیلەیەك هاتە ناو ماڵێك و داوای ئاوی کرد تا بیخواتەوە، بیستی یەکێك دەڵێت: ئەی فەرمانڕەوا خۆت مەشارەوە، کۆیلەیەکە وداوای ئاو دەکات. کۆیلە ئەم وتەی بیست و ڕۆشتە لای یەکێك لەعەیاران( لەناو سوپاکەی موسا کوڕی بوغا) و ئاگاداری کردەوە. ئەو عەیارە سێ پیاوی هەڵگرت و بەرێکەوت. سالحی بینی لەکاتێکدا شانە و ئاوێنەی بەدەستەوە بوو و ریشی شانە دەکات. ئەوی گرت. سالح پاڕایەوە. وتی: ناتوانم رزگارت بکەم، بەلام لەشوێنێکەوە دەتبەم کەبنەماڵە و هاورێ و کەسەکان و فەرماندەکان و هاوەلانت لەوێن، ئەگەر تەنیا دوو پیاو هەوڵی رزگار کردنی تۆ بدەن، رزگارت دەکەم.

ئەویان بەسەر و پێی پەتی هێنایەدەر. هەمووان لەپشت سەری ئەو ڕایان دەکرد. سوار کۆپانی ئێستریکیان کرد و بەرەو کۆشکیان برد. یەکێك لەهاوەلانی موسا بەشمشێر لێیدا، دواتر کوشتیان و سەریان لەجەستە جیا کردەوە و و جەستەیان پشتگوێ خست و پێش ئاوابوونی هەتاو بردیانە کۆشکی خەلیفە. ئەم هەواڵەیان بەموهتەدی راگەیاند. موهتەدی وتی: بەخاکی بسپێرن. سەری ئەویان بەنوکی ڕمەوە کرد و بەناو خەڵکدا سوڕاندیان. هاواریان دەکرد: ئەمەیە سزای ئەو کەسەی خەلیفە موعتەز بکوژێتز

دوای بەخاك سپاردنی ئەو سەری بوغای بچوکیان داگرت کەبەدارەوە بوو. ئەویان تەسلیم بەبنەماڵەکەی کرد. کاتێك سالح کوژرا، سەلوولی شاعیر ئەمەی بەموسا کوڕی بوغا وت:

اخذت كلهم من فرعون حين طغى      و جئت اذ جئت يا موسى على قدر

ثلاثة كلهم باغ اخو حسد يرميك بالظلم و العدوان عن وتر

وصيف في الكرخ ممثول به و بوغا بالجسر كحترق بالنار الشرر

و صالح بن و وصيف بعد منعفر بالحير جثته و الروح في سقر

واتاکەی: ئەی موسا تۆڵەی خۆت لەفیرعەونی سەرکێش وەرگرت و لەو کاتەی قەدەر دیاریکرابوو، گەیشتیت.

سێ کەس بوون (لەدوژمنانی تۆ) هەموویان سەرکێش و رژدیبەر و کە بەهۆی ستەم و دەستدرێژی کردنەوە، تۆیان کردبووە ئامانجی خۆیان.

وەسیف لەکەرخ لەت لەت بوو و بۆغا لەپرد بەهۆی ئاگرەوە سووتا و ساڵح کوڕی وەسیف جەستەی لەحیر خرایە ژێر خاك و گیانی بەرەو دۆزەخ ڕۆشت.

## ناسازگاری خەواریج لەگەڵ موساور

لەم ساڵەدا یەکێك لەخەواریج ناسراو بەعوبەیدە لەڕەچەڵەکی مناڵەکانی زوهەیری عەمرەوی دژی موساور قوت بوویەوە.

هۆکارەکەی ئەوە بوو عوبەیدە بەتۆبەی گوناحکارەکان رازی نەدەبوو و لەبەرابەردا موساور دەیوت: ئێمە بەتۆبە رازی دەبین. عوبەیدە دەیوت: ئێمە رازی نابین. بەم شێوەیە عوبەیدە دەستەیەکی گەورەی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر موساور. موساور لەحەدیسەوە بەرێکەوت و دوو سوپا لەجۆهەینە، نزیك موسڵ، ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. موساور دابەزی و کۆمەڵێك لەهاوەڵانی لەگەڵ ئەو دابەزین. شەڕێکی قورس ڕوویدا. هەموان قاچی ئەسپەکانیان بڕییەوە. عوبەیدە کوژرا و هاوەڵانی هەڵاتن و زۆربەیان کوژران. موساور دەستی بەسەر بەشی زۆری کەنارەکانی عێراق زاڵبوو و ڕێگەی نەدا باج و خەارج بەدەستی خەلیفە بگات. سوپاکەی خەلیفە گرفتاری نەداری و هەژاری بوون. ئەمە بووە هۆی ئەوەی موسا کوڕی بوغا و بابەکیال و دەستەیەك لەسەرکردەکانی دیکە هاوڕێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی موساور بەرێکەون. ئەوان لەسن ئوردوویان لێدا بەڵام دوای ماوەیەك بۆ سامەرا گەڕانەوە. هۆکاری گەڕانەوەی ئەوان لەکاتی ئامارژەدان بەچۆنیەتی لەسەر کار لابردنی موهتەدی باس دەکەین.

کاتێك موعتەمید لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، موفلیحی بۆ جەنگی موساور ڕەوانە کرد. سوپاکەی فراوان و کەرەستەی جەنگ و توێشویان بەئەندازەیەکی فراوان هەڵگرتبوو. کاتێك موفلیح لەحەدیسیە نزیك بوویەوە، موساور ناوچەکەی بەجێهێشت و مەبەستی دوو کێوی کرد بەناوەکانی زەینی و عامر. ئەم دوو کێوە لەنزیك حەدیسە بوون. موفلیح شوێنی کەوت. موساور لەگەڵ چوار هەزار سەرباز بەدەوری سوپاکەی موفلیحدا سووڕایەوە و دواتر ڕووبەڕووی بوویەوە.

مساور کاتی گەڕانەوە لەجەنگی عوبەیدە، ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی ئەوی لەدەوری خۆی کۆکردەوە. ئەوان لەکێوی زەینی جەنگیان لەگەڵ موفلیح کرد. موفلیح نەیتوانی بەخواستەکەی بگات. موساور ڕۆشتە سەر لووتکەی چیاکە و پەنای گرت. موفلیح لەداوێنی کێوەکە دابەزی. لەنێوان ئەم دوو سوپایە چەند جارێك جەنگ ڕویدا. ئەوان لەبەرەبەیانی ڕۆژێك بەشوێن موساوردا گەڕان بەلاَم نەیاندۆزییەوە چوونکە بەرێگەیەکی جیاوازدا ڕۆشتبوو و ناوچەکەی چۆڵ کردبوو. کاتێك موفلیح دوای شەکەتی و ماندووی زۆر و ژمارەی فراوانی بریندارانی سوپاکەی لەسەرکەوتن بێ هیوا بوو، ڕێگەی موسڵی گرتەبەر. لەوێوە ڕۆشتە ڕەبیعەی سەنجار و نەسیبین و خابور و بۆ ماوەیەك کاروبارەکانی ئەو ناوچانەی ڕاپەڕاند. دواتر گەڕایەوە بۆ موسڵ و ڕێگەی چلکەیی لەگەڵ خەڵکەکەی گرتەبەر و لەرەجەب/ژوئەن لەوێ گەڕایەوە و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ موساور خۆی ئامادە کرد. کاتێك لەحەدیسە نزیك کەوتەوە، موساور ئەو ناوچەی بەجێهێشت. موساور لەنەبوونی موفلیح بۆ ناوچەکە گەڕابوویەوە. موفلیح شوێنی کەوت. موساور لەهەر شوێنێك دادەبەزی، موفلیح مەبەستی ئەو ناوچەی دەکرد. کاتێك ماوەی شوێنکەوتنەکە درێژەی کێشا و موفلیح بەدوای موساور چەندین دۆڵ و گەروو و دەربەندی بڕی و سوپاکەی شەکەت و ماندوو بوون، لەشوێنکەوتنی موساور دەستی هەڵگرت و گەڕایەوە. ئەم جارە موساور شوێن موفلیح کەوت و قاچی دەخستە شوێن پێی ئەو. ئەو کەسانەی گرفتار دەکرد کە لەکاروانەکە دوا دەکەوتن. بەم شێوەیە دەستەیەك لەسوپاکەی موفلیح گەڕانەوە و

دژی ئەو جەنگان و دووبارە پەیوەستی سوپا بوونەوە. کاتێك گەیشتنە حەدیسە، موفلیح چەند رۆژێك لەوێ مایەوە و لەسەرەتای رەمەزان/ دووی ئۆگۆست بۆ سامەرا گەڕایەوە. موساور دوای گەڕانەوەی موفلیح بەسەر شارەکاندا زاڵبوویەوە و باج و خەراجی وەرگرت. بەم شێوەیە پێگەی بەرز بوویەوە.

## چۆنیەتی لابردن و مەرگی موهتەدی

لەپانزەی رەجەب/ نۆزدەی ژوئەنی ئەم ساڵە، موهتەدی لەسەر کار لابرا و لەهەژدەی ئەم مانگە/ بیست و دووی ژوئەن چاوی لەجیهان بەست.

هۆکارەکەی ئەوە بوو دانیشتوانی تورکی کەرخ – ئاماژەمان پێدا– لەسەرەتای رەجەب/ چواری ژوئەن بۆ رۆژانەی خۆیان جەنگان و داوای مانگانەیان دەکرد. موهتەدی، باوکی قاسمی برای خۆی لەگەڵ کەیغەلەغ و دەستەیەکی دیکە بۆ لای ئەوان نارد. نێردراوان ئەوانیان هێور کردەوە و گەڕانەوە.

باوکی نەسر محەممەد کوڕی بوغایان ئاگادار کردەوە کەموهتەدی بەتورکەکانی وتووە: هەموو سامانەکان لای محەممەد و موسا، دوو کوڕەکەی بوغایە. هەمان شەو باوکی نەسر کوڕی بوغا بۆ لای براکەی لەسن هەلاّت کەرووبەرووی موساور ببوویەوە. موهتەدی چوار پەیمان نامەی ئەمانی بۆ نارد و ئەو لەگەڵ حەیسونی برای گەڕانەوە. موهتەدی هەردووکیانی زیندانی کرد. کەیغەلەغ هاورێیەتی ئەوانی دەکرد. ئەو لەباوکی نەسر داوای سامانەکانی کرد و لەیاریدەدەرەکەی ئەو پانزە هەزار درهەمی سەند. دواتر باوکی نەسر لەسێی رەجەب/ حەوتی ژوئەن کوژرا و جەستەی بێ گیانی ئەویان فڕدایە ناو چاڵێك. جەنازەکەی بۆگەنی کرد. دواتر دەریانهێنا و بردیانەوە بۆ ماڵەکەی. حەسەن کوڕی مەئمون نوێژی لەسەر خوێند.

کاتێك موهتەدی براکەی موسا کوڕی بوغای زیندانی کرد، نامەیەکی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا سوپا بەبابەکیال بسپێرێت و خۆی لەگەڵ ئەو بەرێکەوت. نامەیەکی بۆ بابەکیال نووسی تا بارودۆخی سوپا سەقامگیر بکات و لەجەنگ دژی موساوری شاری بەردەوام بێت و موسا کوڕی بوغا و موفلیح لەناو ببات. بابەکیال

نامەکەی وەرگرت و ڕۆشتە لای موسا و نامەکەی بۆ خوێندەوە، وتی: من لەم کارە ڕازی نیم و ئەم پیلانێکە بۆ لەناو بردنی هەموومان، بۆچوونی تۆ چییە؟ موسا وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بڕۆیتە سامەڕا و ئاگاداری بکەیتەوە کەدوژمنی من و موفلیحیت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەویت تا ئەو جێگەی دەبیتە یەکێك لەکەسە باوەڕپێکراوەکانی، دواتر بیر لەڕێگە کوشتنی بکەرەوە و ڕێگە چارەیەك بدۆزەرەوە.

بابەکیال ڕێگەی سامەڕای گرتەبەر و لەگەڵ یارکوج و ئەسارتەکین و سیمای باڵابەرز و دەستەیەکی دیکە هاتە ناو سامەڕا. ئەوان لەدوانزەی ڕەجەب/ شانزەی ژوئەن هاتە ناو کۆشکی خەلافەت. موهتەدی بابەکیالی گرت و کەسانی دیکە گەڕێنرانەوە. هاوەڵانی تورك و ناتورکەکانی بابەکیال کۆبوونەوە و وتیان: بۆ فەرماندەکەی ئێمەت زیندانی کردووە؟ بۆ باوکی نەسر کوڕی بوغا کوژرا؟

ساڵح کوڕی عەلی کوڕی یەعقوب، مەنسور لای موهتەدی بوو. موهتەدی ڕاوێژی لەگەڵ کرد. ساڵح وتی: هیچ یەك لەپێشینانی تۆ هاوشێوەی تۆ بوێر نەبوون. ئەبوموسلیم لەروانگەی خوراسانییەکان زیاتر لەبابەکیال لای هاوەڵانی بەهادار و بایەخدار بوو بەشێوەیەك ژمارەیەك لەوان دەیانپەرەستی بەڵام کاتێك سەری بڕاوی ئەویان خستە نێوانیان، هەموویان بێدەنگ بوون. ئەگەر تۆیش ئەو کارە بکەیت، هەمووان بێدەنگ بوون.

موهتەدی سوار ئەسپەکەی بوو و سوپاکەی خۆی لەمەغریبی و تورك و فەرغانی ڕازاندەوە. مەسروری بەلْخی لەباڵی ڕاست دانا و فەرماندەیی باڵی چەپی بەیارکوج و خۆی لەگەڵ ئەستارکین و تەبایغوا و سەرکردەکانی دیکە لەدڵی سوپاکەدا جێگیر بوو. فەرمانیدا سەری بابەکیال بێنن. (ئەویان کوشت) و عیتاب کوڕی عیتاب سەری ئەوی فڕێدایە ناو ئەوان.

ئەوان هێرشیان کردە سەر عیتاب و کوشتیان. تورکەکانی باڵی ڕاست و چەپی سوپاکەی موهتەدی پەیوەستی شۆڕشگێڕەکان بوون. کەسانی دیکە هەڵاتن و موهتەدییان بەتەنیا بەجێهێشت. لەهەردوو سوپا ژمارەیەکی فراوان کوژران. دەستەیەك ژمارەی کوژراوەکان بەحەوتسەد و هەشتا کەس و کوژراوانی تورك

بەچوار هەزار کەس دەخەمڵێنن. دەستەیەکیش کوژراوەکان بەدوو هەزار یا هەزار سەرباز دەزانن.

لەهاوەڵانی موهتەدی ژمارەیەکی زۆر کوژران یا هەڵاتن. موهتەدی شمشێر بەدەست هاواری دەکرد: ئەی موسوڵمانان، من سەروەری باوەڕدارانم، لەرێگەی ئەودا بجەنگن، بەڵام کەس وەڵامی نەدەدایەوە. موهتەدی بەرەو زیندانەکان ڕۆشت و بەگومانی ئەوەی ئەوان هاوکاری دەکەن، دەرگای زیندانەکانی کردەوە و زیندانییەکانی ئازاد کرد بەڵام ئەوانیش هەڵاتن و کەس هاوکاری نەکرد. دواتر موهتەدی بەرەو ماڵی ئەحمەد کوڕی جەمیل ئەسپی غاردا و لەکاتێکدا تورکەکان بەدوایەوە بوون، ڕۆشتە ئەوێ. تورکەکان گەیشتن و ئەویان هێنایەدەر. سوار ئێسترێکیان کرد و بەرەو کۆشك بەرێکەوتن و لای ئەحمەد کوڕی خاقان زیندانیان کرد. وەك دەڵێن موهتەدی هەزاران جار دەستی ئەوی ماچ کرد و لەنێوان ئەوان و شۆڕشگێڕەکان گفتوگۆ بەردەوام بوو. ئەوان لەزیندان داوایان لێکرد دەست لەکار بکێشێتەوە بەڵام ئەو ڕازی نەدەبوو و کوژرانی بەپەسەندتر دەزانی. دەڵێن: موهتەدی نامەیەکی بۆ موسا کوڕی بوغا و بابەکیال و دەستەیەك لەسەرکردەکانی خۆی نووسیبوو کەئەگەر فێڵیان لێ بکات یا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەناویان ببات یا بیر لەکوشتنی ئەوان بکاتەوە یا گرنگی بەوتەکانی نەدات، بەیعەتی ئەویان لەسەر شان نییە و ئەوەی دەخوازن، دەتوانن ئەنجامی بدەن و هەر کەس بخوازن دەتوانن وەك خەلیفە دەستنیشانی بکەن. بەمشێوەیە کوشتنی ئەویان بەڕەوا زانی و هێلکەگونی ئەویان پێشێل کرد و دواتر بەرادەیەك ئەشکەنجەیان کرد تا مرد. دەستەیەك شایەتییاندا کەئەو مرد بێ ئەوەی شوێنەواری ئەشکەنجە بەجەستەیەوە دیار بێت. ئەویان لەئارامگای مونتەسیر بەخاك سپارد.

دەستەیەك هۆکاری دەست لەکارکێشانەوە و کوژرانی ئەو بەمە دەزانن: دانیشتوانی کەرخ و دور کۆبوونەوە و خوازیاری بینینی موهتەدی بوون تا لەنیازەکانی خۆیان ئاگاداری بکەنەوە. ئەوان ڕۆشتنە کۆشك. باوکی نەسر محەممەد کوڕی بوغا و سەرکردەکانی دیکە لای موهتەدی بوون. باوکی نەسر

لەنێوان ئەوان ڕۆشتەدەر و خەڵكانی كەرخ و دور ڕۆشتنە ناو. لای موهتەدی باسی نیازەكانی خۆیان كرد. ژمارەیان چوار هەزار كەس بوو. داوایان لەموهتەدی كرد فەرماندەكانیان لەسەر كار لاببات و كاروباری ئەوان بەبراكانی بسپێرێت و ئەو سامانەی كەسانی ناو كۆشك دەستیان بەسەردا گرتووە، وەربگرێتەوە. موهتەدی بەڵێنی پێدان نیازەكانیان دابین دەكات. ئەو ڕۆژە لەكۆشكدا مانەوە. موهتەدی خواردنی بۆ ئەوان ئامادە كرد. محەممەد كوڕی بوغا بەرەو محەممەدییە بەرێكەوت و ڕۆژی دواتر ئەوان خوازیاری جێبەجێ كردنی نیازەكانیان بوون. پێیان وترا: جێبەجێ كردنیان دژوارە و دوور خستنەوەی سەركردەكان كارێكی ئاسان نییە چ بگات بەوەی سامانەكانیان لێ بسەندرێتەوە. ئێوە سەرقاڵی كارەكانی خۆتان بن و خۆڕاگری بكەنە پیشە تا ئێمە بەخواست و مەبەستەكانی خۆمان بگەین و سەروەری باوەڕداران داواكارییەكانی ئێوە دێنێتەدی. ئەوان تەنیا بەجێبەجێ كردنی داواكارییەكانیان رازی بوون. ناچاریان كرد بۆ بەیعەتەكەی خۆیان ئەمەكدار بن و لەجەنگدا شان بەشانی سەروەری باوەرداران بجەنگن و خوازیاری چاكە و خێری ئەوبن تا مەبەستەكانیان بێتەدی.. ئەوان رازی بوون و دووبارە سوێند وبەیعەتیان لێ وەرگیرا.

دواتر بەنامەیەك، باوكی نەسر كوڕی بوغایان لەمەبەستی خۆیان و موهتەدی ئاگادار كردەوە و ڕۆشتنەدەرەوەی بێهۆی موهتەدییان لەكۆشك بەناپەسەند زانی چوونكە ئەوان بۆ بەرز كردنەوەی سكاڵا ڕۆشتبوونە كۆشك. ئەوان كاتێك بینیان كۆشك پاسەوانی نییە، لەوێ مانەوە تا باوكی نەسر گەڕایەوە بۆ بارەگای موهتەدی و دەست و پێی موهتەدی ماچ كرد و وەستا. موهتەدی سەبارەت بەسامان و ئەوەی توركەكان دەیانوت، پرسیاری لێكرد. لەوەڵامدا وتی: من لەكوێ و سامانی ئەوان لەكوێ؟ موهتەدی وتی: مەگەر ئەم سامانە لای تۆ و براكان و هاوەڵانی تۆ نییە؟ دواتر دەستی محەممەدیان گرت و زیندانییان كرد. نامەیان بۆ موسا كوڕی بوغا و موفلیح نووسی بۆ ئەوەی بۆ سامەرا بگەڕێنەوە و سوپا بەو سەركردانە بسپێرن كەناویان بردووە. نامەیان بۆ سەركردە توركەكان (بەپێگەیەكی نزمتر) نووسی تا سوپاكە لەوان وەربگرن. ڕووداوەكانیان بۆ نووسین و وتیان:

ئەگەر موسا و موفلیح لەهاتنە بۆ سامەرا و ڕادەست کردنەوەی سوپا فەرمانبردار بوون چ باشتر وەگەرنە قۆڵبەست و ڕەوانەی سامەرایان بکەن.

موهتەدی ئەوانەی بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو، یەکی دوو درهەمیان پێدابوو. کاتێك نامەکان بەسوپای موسا گەیشت و بۆی خوێندرایەوە، بەیعەتی لەسوپاییەکان سەند بۆ ئەوەی هاوکاری بکەن. هەمووان بەرەو سامەرا بەرێکەوتن و شەوی پانزەی ڕەجەب/ پانزەی ژوئەن لەپردی ڕەقیق ئوردوویان لێدا. موهتەدی لەکۆشك هاتەدەر و بەناو سەربازەکاندا گەڕا و هەمان ڕۆژ گەڕایەوە. خەڵك شەویان کردە ڕۆژ و نزیکەی هەزار سوار لەهاوەڵانی موسا هاتنە ناو شار. کوبکین و کەسانی دیکە لەناویاندا دەبینران. موهتەدی لەکۆشك هاتەدەر و سوپاکەی ڕازاندەوە. لەناو ئەم سوپایە کەسانێك دەبینران کە لەسوپاکەی موسا جیاببوونەوە و پەیوەستی سوپای خەلیفە ببوون. نوێنەرەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد تا موسا فەرمانڕەوایەتی ناوچەیەکی پێ بسپێردرێت و ڕەوانەی ئەو دیارە ببێت بەڵام موهتەدی و هاوەڵانی پێداگرییان دەکرد لەوەی دەبێت موسا سەبارەت بەسامانەکەی لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت. بەم پێیە ئەم دوو دەستەیە نەگەیشتنە ئەنجام.

ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی موسا لێی جیابوونەوە و موسا و موفلیح مەبەستی خوراسانیان کرد. لەم کاتەدا بابەکیال و دەستەیەکی دیکە لەسەرکردەکان گەیشتن و ڕۆشتنە کۆشکی موهتەدی و سڵاویان بۆ نارد. موهتەدی فەرمانی گەڕانەوەی پێدان و بابەکیالی زیندانی کرد و دواتر کوشتی. کەس لەشوێنی خۆی نەجووڵا و جگە لەگۆڕانکارییەکی کەم هیچی دیکە ڕووینەدا.

بۆ یەکشەممە، تورکەکان بۆ یەکسانی خۆیان لەگەڵ فەرغانییەکان بۆ ڕۆشتنە ناو کۆشك ڕەخنەیان گرت و وتیان بۆ دەبێت ئەوان وەك تورکەکان مۆڵەتی ڕۆشتنە ناو کۆشکیان هەبێت. بەم شێوەیە وەڵامیان درایەوە کەهۆکارەکەی سەرکردە تورکەکانن. بەم شێوەیە تورکەکان هەموویان کۆشکیان بەجێهێشت و فەرغانییەکان مانەوە و مەغربییەکان. تورکەکان هەم ئەم کارەیان پەسەند نەکرد هەم داوای بابەکیالیان دەکرد. موهتەدی، فەرغانی و مەغربییەکانی لەمەبەستی تورکەکان ئاگادار کردەوە و پێی وتن: ئەگەر خۆتان بەبەهێز دەزانن، من نزیك بوونەوە لەئێوە بەناپەسەند نازانم و گەرنە پێش ئەوەی بارودۆخ زیاتر لەمە نائارام بێت، ئەوانی ڕازی دەکەم. ئەوان

وەلاّمیان دایەوە کەخۆیان کاروبارەکان بەرێوە دەبەن. موهتەدی لەگەڵ ئەوان لەکۆشك هاتەدەر. ژمارەیان شەش هەزار کەس بوو. هەزار تورك لەهاوەلاّنی ساڵح کوڕی وەسیف لەناو ئەواندا دەبینران. ژمارەی تورکەکان دەهەزار کەس بوو. کاتێك دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە، هاوەلاّنی ساڵح هەلاّتن و لەم کاتەدا دەستەیەك لەتورکەکان هێرشیان کردنەسەر. سوپاکەی موهتەدی شکستی خوارد و ئەوە روویدا کەپێشتر باسمان کرد بەزیاد کردنی ئەم وتەیە کەموهتەدی لەماڵی ئەحمەد کوڕی جەمیل جەنگی. دواتر ئەویان بریندار لەماڵەکەی هێنایەدەر. موهتەدی کاتێك برینەکەی خۆی بینی، خۆی بەدەستەوەدا. داوایان لێکرد دەست لەخەلافەت هەڵگرێت بەلاّم رازی نەبوو. رۆژی چوارشەممە مرد و رۆژی پێنجشەممە جەنازەی ئەویان نیشانی خەڵکاندا و جەعفەر کوڕی عەبد واحید نوێژی لەسەر خوێند. پێش مردن پەنجەی دەست و قاچیان بڕیبوویەوە و بەرادەیەك ئەشکەنجەیان کرد تا گیانی سپارد. بەشوێن محەممەد کوڕی بوغادا گەڕان بەلاّم بەکوژراوی دۆزییانەوە. هەزار شمشێریان لەسەر گۆڕەکەی شکاند.

موهتەدی یانزە مانگ و پانزە رۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد و سی و هەشت ساڵ ژیا. ناوچاوێکی پان، گەنم رەنگ و لاواز بوو. چاوەکانی خۆڵەمێشی، رووگرژ و ورگ زل و شان پان وکورتەبالاّ و ڕیشێکی درێژ بوو. لەقاتول چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## کردەوە و ئاکاری موهتەدی

موهتەدی باللە باشترین خەلیفەکان لەدینداریدا بوو، چاکەکارتر و داوێن پاکتر لەخەلیفەکانی پێشوو بوو.

عەبدوللە کوڕی ئیبراهیمی ئیسکافی دەڵێت: موهتەدی خۆی بۆ لێپرسینەوە لەسکالاّی خەڵکان دادەنیشت. رۆژێك پیاوێك سکالاّی لەکوڕەکەی ئەو کرد. موهتەدی فەرمانیدا کوڕەکەی بێنن. ئەو دوانەی لای یەك دانیشاند تا لەنێوان ئەوان داوەری بکات. ئەو پیاوە بەموهتەدی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران تۆ بەو شێوەیت کەشاعیر دەڵێت:

حكمتوه فقضى بينكم ابلج مثل القمر الزاهر

لا يقبل الرشوة فى حكمه        و لا يبالى غبن الخاسر

واتاکەی: کەسێکتان وەك داورەی خۆتان هەڵبژاردووە کەرۆشن وەك مانگی درەوشاوەیە. لەداوەری کردن بەرتیل وەرناگرێت و لەوەی زیان لەزۆردار بدات، ترسی نییە.

موهتەدی وتی: ئەی پیاو، خواوەند پاداشتت بداتەوە، بەلاّم لێرە ئامادە نەبووم تا ئەم ئایەم خوێندەوە: (( و شایەنەکانی داد لەرۆژی هەستانەوە دادەنێین.))[2] ئیسکافی دەڵێت: لەم رۆژەدا زیاتر لەهەر رۆژێکی دیکە دەگریا. ( یا خەڵکانێکی زۆر لەم رۆژەدا گریان)

باوکی عەباس کوڕی هاشم کوڕی قاسمی هاشمی دەڵێت: لەیەکێك لەئێوارێکانی مانگی رەمەزان/ ئۆگۆست، لای موهتەدی بووم. هەستام بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بەلاّم موهتەدی مۆڵەتی پێ نەدام. دانیشتم. نوێژی ئێوارێی لەگەل ئێمەدا خوێند و فەرمانیدا خواردنی بەربانگ بێنن. تەبەقێکی سەرداپۆشراویان هێنا، دوو نانی لەسەر بوو، لەدەفرێك خوێ، لەدەفرێك رۆن و لەدەفرێکی دیکە سرکەیان هێنا. بۆ خواردن بانگی کردم. بەگومانی ئەوەی دوای ئەمە خواردنی دیکە دێت، کەمێکم لێخوارد. کاتێك موهتەدی ئەمەی بینی، وتی: بەرۆژوو نەبوویت؟ وتم: بەڵێ، بەرۆژوو بووم. وتی: ئایا بەیانی بەرۆژو نابیت؟ وتم: چۆن لەمانگی رەمەزان بەرۆژوو نابم؟ وتی: کەواتە بخۆ و خۆت تێر بکە چوونکە زیاتر لەمە خواردنی دیکە لێرە نابینیت. لەقسەکەی سەرم سوڕما و پرسیم: بۆ ئەی سەروەری باوەڕداران؟ خواوەند نیعمەتی فراوان و رۆژانەیەکی بەسەندەی بەتۆ بەخشیوە. موهتەدی وتی: راست دەکەیت، سپاس بۆ خودا، بەلاّم بیرم لەوە کردەوە کەمناڵەکانی ئومەییە عومەر کوڕی عەبدولعەزیزیان بوو، رژدیم بەوە برد بۆ مناڵەکانی هاشم خەلیفەیەکی وەك ئەویان لەناو خۆیاندا نەبێت. لەبەر ئەمە خۆم بۆ ئەم کارە تەرخان کرد کەدەیبینی.

ئیبراهیم کوڕی مەخلەد کوڕی محەممەد کوڕی عەرەفە لەزمانی یەکێك لەمناڵەکانی هاشم دەڵێت: سەوەتەیەکیان لەماڵەکەی موهتەدی دۆزییەوە کەجل و

---

[2] و نضع الموازين القسط ليوم القيامة. (انبيا/ ٤٧)

بەرگی پەشمین و راخەرێك و كلاوی شەوی تیابوو، شەوانە لەبەری دەكرد، نوێژی دەخوێند و دەیوت: ئایا منداڵەكانی عەباس شەرم دایاننناگرێت كەسێكی وەك عومەر كوڕی عەبدولعەزیز لەناو ئەواندا نەبێت؟ ئەو رابواردن و خۆشییەكانی ژیانی پشتگوێ خستبوو، گۆرانی خوێند و بادە خواردنەوەی بەناڕەوا دەزانی و رێگەی نەدەدا كەسانی ناو كۆشك ستەم لەخەڵكان بكەن. خواوەند بیبەخشێت و لێی خۆش بێت. (گەر بەو شێوە بووبێت).

## خەلافەتی موعتەمید عەلی الله

كاتێك موهتەدی بالله یان گرت و زیندانییان كرد، باوكی عەباس ئەحمەد كوڕی متوەكیل ناسراو بەكوڕی فەتیان یان هێنا كە لەناو كۆشك دەستبەسەر كرابوو. خەڵك و توركەكان دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ كرد و ئەم هەواڵەیان بۆ موسا كوڕی بوغا نووسی. موسا لەخانەقین بوو. ئەویش هاتە سامەرا و بەیعەتی كرد. نازناوی موعتەمید بالله یان پێبەخشی.

موهتەدی لەدووەم رۆژی خەلافەتی موعتەمید مرد و خەڵكان ئارام بوونەوە. موعتەمید، عوبەیدالله كوڕی یەحیا كوڕی خاقانی وەك وەزیر هەڵبژارد.

## بەسەرهاتی ساحەبی زەنج

لەم ساڵەدا جەعلان بۆ جەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج بۆ بەسرە ڕەوانە كرا. كاتێك گەیشتە بەسرە، لەناوچەیەك ئوردووی لێدا دووری ئەو لەگەڵ ساحەبی زەنج یەك فەرسەنگ بوی. جەعلان بۆ خۆی و سوپاكەی سەنگەری هەڵكەند و شەش مانگ لەناو ئەم سەنگەرەدا چاوەڕوانی كێشا. جەعلان لەو رۆژەی بۆ جەنگ دیاریان كردبوو، زەینەبی و منداڵەكانی هاشم و كەسانی دیكە كەبۆ جەنگی ساحەبی زەنج ئامادە ببوون، ڕەوانە كرد بەڵام تەنیا بەبەرد هاویشتن و تیرهاویشتن كۆتاییان بەجەنگ هێنا. جەعلان لەبەر تەنگی و تەسكی رێگە بۆ جەولان و غاردانی ئەسپەكان رێگەیەكی نەبینی بۆ ئەوەی رووبەڕووی ساحەبی زەنج ببێتەوە.

زۆرینەی سوپاکەی سوارکار بوون. کاتێك مانەوەی ئەوان لەناو سەنگەرەکەدا درێژەی کێشا، ساحەبی زەنج هاوەڵانی خۆی بۆ ناو سەنگەرەکە ڕەوانە کرد. ئەوان بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر جەعلان و دەستەیەك لەسوپاکەی ئەویان کوشت. ئەوانەی مابوونەوە، گرفتاری ترسێکی تۆقێنەر بوون. زەینەبی، بەلالییە و سەعدییەی لەدوو قۆڵەوە ڕەوانە کرد و ئەوان ڕووبەڕووی ساحەبی زەنج بوونەوە. ساحەبی زەنج سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. بەم شێوەیە جەعلان سەنگەرەکەی بەجێهێشت و ڕووی کردە بەسرە. ناتەوانی ئەو لەجەنگ لەگەڵ ڕەش پێستەکان ئاشکرا بوو، ڕێگەیان پێنەدا چیتر لەگەڵ ڕەش پێستەکان بجەنگێت و سەعیدی پەردەداریان بۆ جەنگی ساحەبی زەنج ڕەوانە کرد.

دواتر ساحەبی زەنج ئەو سوێرەلانەی (زەوی سوێر، شۆرەکات) بەجێهێشت و لەڕووباری ئەبوخەسیب دابەزی. دەستی بەسەر بیست و چوار کەشتی لەکەشتییەکانی هێزی دەریایی گرت و بەئەندازەیەك کاڵای لەم کەشتییانە تاڵان کرد کەخەملاندنی ئاسان نییە. ئەوان کەشتیوانەکانیان کوشت. سوپاکەی ساحەبی زەنج بۆ ماوەی سێ ڕۆژ سەرقاڵی تاڵانی بوون. ساحەبی زەنجیش بڕێك کەل و پەل و کاڵای بۆ خۆی تاڵان کرد.

## ڕۆشتنی ڕەش پێستەکان (زەنگییەکان) بۆ ئوبولە (ئەبێلە، ئاویلا)

لەم ساڵەدا زەنگییەکان ڕۆشتنە ئەبێلە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەیان کوشت و شارەکەیان سوتاند.

پاڵنەری ئەم کارە ئەوە بوو کاتێك جەعلان لەسەنگەرەکەی خۆی هاتەدەر و ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر، ساحەبی زەنج بەردەوام بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی دەکردە سەر ئەبێلە. دەستە جەنگییەکانی ئەو لەکەنار ڕووبارەکە سەنگەریان دروست کردبوو و بەردەوام تا ڕۆژی چوارشەممە بیست و پێنجی ڕەجەب/ بیست و نۆی ژانویە دەجەنگان تا ئەوەی ئەبێلە دەستی بەسەردا گیرا. لەم ناوەدا باوکی ئەحوەس و عوبەیداللە کوڕی حومەید کوڕی توسی کوژران و زەنگییەکان

شارەکەیان سووتاند.

ئەم شارە لەدار و تەختە دروست کرابوو. لەبەر ئەمە ئاگر بەخێرایی تەشەنەی کرد و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی کوژران و سامانەکانیان تالآن کرا. بەلاّم ئەوەی زیاتر بووە خۆراکی ئاگر، ئەو سامان و کەل و پەلانە بوون کەتالآن کرا.

## زاڵبوونی زەنگییەکان بەسەر عەبادان (ئابادان)

لەم ساڵەدا خەڵکانی ئابادان کەسیان بەدوای ساحەبی زەنج نارد تا بێ جەنگ شارەکەی تەسلیم بکەن. پاڵنەری ئەوان بۆ ئەم کارە، کردەی ساحەبی زەنج لەگەڵ خەڵکانی ئەبێلە بوو کەبووە هۆی ترس و تۆقانی خەڵکانی ئابادان. نامەیەکیان بۆ ساحەبی زەنج نووسی و داوای ئەمانیان لێکرد تا شارەکەی تەسلیم بکەن. ساحەبی زەنج ئەمانی پێبەخشین و ئەوان شارەکەیان تەسلیم کرد. ئەو دەستەیەك لەهاوەلاّنی بۆ ئەو شارە نارد و کۆیلە و کەرەستەکانی جەنگیان کۆکردەوە و لەناو سوپاکەی دابەشی کرد.

## زاڵبوونی ساحەبی زەنج لەئەهواز

کاتێك عەلەوی بەسرە(ساحەبی زەنج) دەستی بەسەر ئەبیلە و ئابادانذا گرت، تەماحی گرتنی ئەهوازی کرد. لەبەر ئەمە لەگەڵ سوپاکەی بەرەو جەی[٢] بەرێکەوت. خەڵکەکەی توانای خۆڕاگرییان نەبوو و هەلاّتن. ڕەشەکان هاتنە ناو شارەکە و ئەوەی بینیان، کوشتیان، سوتاندیان و تالآنیان کرد و ئەوبەری جەی یان وێران کرد و کاتێك گەیشتنە ئەهواز، خەڵکان وسوپاکان لەبەرابەریان هەلاّتن و تەنیا ژمارەیەکی کەم مانەوە. زەنگییەکان ڕۆشتنە ناو شارەکە و هەموو شتێکیان وێران کرد. ئیبراهیم کوڕی مودەبیر، لەوێ بوو. دوای ئەوەی برینداریان کرد، گرتیان و سامانەکەیان تالآن کرد. ئەم ڕووداوە لەدوانزەی ڕەمەزان/ چواری ئۆگۆست ڕوویدا.

کاتێك ئەم بەلاّیان بەسەر ئەو سێ شارەدا هێنا، خەڵکانی بەسرەیش ترسان و

---

[٢] : لەمێژووی تەبەری بەجەبی هاتووە. (وەرگێڕ)

ژمارەیەکی زۆری ئەوان بۆ شارەکانی دیکە هەڵاتن.

## لابردنی عیسا کوڕی شێخ لەشام و فەرمانڕەوایی ئەو لەئەرمەنستان

کاتێك کوڕی شێخ دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت، لەناردنی باج و خەراج و کاڵاکانی دیکە بۆ بەغداد خۆی بەدوور گرت (سەربەخۆ بوو). کوڕی مودەبیر لەمیسر، حەوتسەد هەزار دیناری خەراجی لەمیسرەوە بۆ بەغداد نارد بەڵام عیسا کوڕی شێخ دەستی بەسەردا گرت.

حسەینی خزمەتکار لەبەغدادەوە بۆ لای کوڕی شێخ ڕەوانە کرا و داوای پارەکەی کرد. ئەو وتی: پارەکەی بۆ سوپا هەزینە کردووە. حسەینی خزمەتکار فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ئەرمەنستانی پێدا تا پێشنیاری بەستنی موعتەمید بەخەڵکان بکات. ئەو پێشتر بەم کارە رازی نەبوو. ئەو فەرمانەکەی وەرگرت و پێشنیاری بەستنی بەیعەت لەگەڵ موعتەمیدی بەهەموان کرد. جل و بەرگی ڕەشی لەبەر کرد و گومانی دەکرد جگە لەئەرمەنستان، فەرمانڕەوایەتی شامیشی لەدەستدا دەمێنێت.

موعتەمید جەوری ڕەوانە کرد و فەرمانڕەوایەتی شام و دەوروبەری بەو سپارد. جەور لەگەڵ هەزار سەرباز بەرێکەوت. کاتێك لەدیمەشق نزیك کەوتەوە، عیسا، کوڕەکەی مەنسوری لەگەڵ بیست هەزار سەرباز بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. کاتێك دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، سوپاکەی مەنسور شکستی خوارد و مەنسور کوژرا. بەم شێوەیە عیسا لاواز و لەرێگەی کەنارەکانەوە بەرەو ئەرمەنستان بەرێکەوت. جەور فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی گرتەدەست.

## شۆڕشی کوڕی صۆفی عەلەوی لەمیسر

لەم ساڵەدا لە(صعید) [٤]ی میسر پیاوێکی عەلەوی شۆڕشی کرد. ئەویان بەئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناو بردووە. بەکوڕی صۆفی بەناوبانگە. دەستی بەسەر شاری ئەسنادا گرت و تالانی کرد. خراپەکاری ئەو شارەکانی گرتەوە.

ئەحمەد کوڕی تولون سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. پیاوی عەلەوی شکستی بەم سوپایە هێنا و فەرماندەی سوپاکەی ئەسیر کرد، دەست وپێی بڕییەوە وچوارمێخەی کێشا. کوڕی تولون سوپایەکی دیکەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. دوو سوپا لەکەنارەکانی ئەخمیم ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. سەرئەنجام پیاوی عەلەوی شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی کوژران. عەلەوی هەڵات و خۆی گەیاندە دارستانێکی خورما. لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٢٥٩/ ٨٧٢ ئاماژەی پێ دەدەین.

## دەرکەوتنی عەلی کوڕی زەید لەکوفە و ڕۆشتنەدەرەوەی ئەو لەم شارە

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی زەیدی عەلەوی لەکوفە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستی بەسەردا گرت. جێگری خەلیفەی لەو شارەدا دەرکرد و خۆی لەوێ مایەوە.

خەلیفە، شا کوڕی میکالی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو نارد. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. شا شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران. شا رزگاری بوو.

دواتر موعتەمید کەیجوری تورکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا پێشنیاری فەرمانبەری بەعەلی کوڕی زەید بکات. ئەو کەسی بەدوای عەلی کوڕی زەید نارد و پێشنیاری فەرمانبەری پێکرد و ئەمانی پێبەخشی.

عەلی چەندین داواکاری هێنایە ئاراوە بەڵام کەیجور ڕازی نەبوو. دواتر عەلی

[٤]- میسری سەرەو، یانی سەرزەمینەکانی نێوان باکوری قاهیرە و تاڤگەکانی ئەسوان.

کوڕی زەید لەکوفەوە ڕێگەی قادسیەی گرتەبەر و لەوێ ئوردووی لێدا. کەیجور لەسێی شەوالی ئەم ساڵە، چواری سێپتامبەر ڕۆشتە ناو کوفە.

عەلی کوڕی زەید ڕێگەی خەفانی گرتەبەر و گەیشتە سەرزەمینی مناڵەکانی ئەسەد. پەیوەندی خزمایەتی لەنێوان ئەواندا بوو. عەلی ماوەیەك لەناو ئەواندا مایەوە و دواتر ڕێگەی جەنبەلای گرتەبەر.

کەیجور ئاگادار بوویەوە و لەکۆتایی زیحەجە/ بیست و نۆی نۆڤەمبەری ئەم ساڵە لەکوفەوە بەرێکەوت و ژمارەیەك لەهاوەڵانی ئەوی کوشت و دەستەیەکی ئەسیر کرد. دواتر کەیجور بۆ کوفە گەڕایەوە و کاتێك کاروبارەکانی کوفە سەقامگیر بوون، بێ هیچ فەرمانێك لەلایەن خەلیفەوە ڕێگەی سامەرای گرتەبەر. خەلیفە ژمارەیەك لەسەرکردەکانی بۆ لای ئەو نارد وئەوان لەعوکبەرا لەمانگی رەبیع الاوەل/ ژانویەی ساڵی ٨٧١/٢٥٧ زایینی کوشتیان.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا سەعید کوڕی ساڵح کوڕی حاجب بەفەرمانی خەلیفە بۆ جەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا موساوری خارجی و هاوەڵانی موسا کوڕی بوغا لەکەنارەکانی خانەقین جەنگان. ژمارەی سەربازەکانی موساور فراوان و ژمارەی سەربازەکانی موسا لەدووسەد کەس تێنەدەپەڕی. ئەوان ڕووبەڕووی موساور بوونەوە و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی ئەویان کوشت.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی واسڵ کوڕی ئیبراهیمی تەمیمی لەخەڵکانی فارس، لەگەڵ پیاوێك لەکوردەکانی ئەم ناوچە بەناوی ئەحمەد کوڕی لەیس، دژی حارس کوڕی سیما فەرمانڕەوای فارس شۆڕشیان کرد و کوشتیان. محەممەد کوڕی واسڵ دەستی بەسەر فارسدا گرت.

لەم ساڵدا موفلیح بۆ جەنگی موساور ڕەوانە کرا.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەیدی تالبی لەمانگی رەمەزان/ ئۆگۆست دەستی بەسەر شاری ڕەی گرت و موسا کوڕی بوغا لەشەوال/ سێپتامبەر لەگەڵ سوپاکەی

بەرەو ڕەی کەوتە ڕێ. موعتەمید ئەوی ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا ئیمام عەبدوللە محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمی بوخاری جوعفی نوسەری کتێبی مسند صحیحی (بوخاری) مرد. ساڵی لەدایك بوونی ئەو بە١٩٤/٨٠٩ زاییینی دەزانن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و حەوتی کۆچی ( ٨٧١ زایینی )

**گەڕانەوەی باوکی ئەحمەد موەفەق لەمەککەوە بۆ سامەرا**

کاتێك پێگەی زەنگییەکان بەرز بوویەوە و شارەکانیان گرفتاری ئاژاوە کرد و لەهەموو ناوچە ئیسلامییەکاندا خراپەکارییان کردە پیشە، موعتەمید عەلی الله، براکەی باوکی ئەحمەدی لەمەککەوە بانگ کردەوە، کاتێك هات، کوفە، پارێزگاری ڕێگەی مەککە، حەرەمەین(مەککە و مەدینە) یەمەن و دواتر بەغداد و ناوچەکانی دەوروبەر، واست، ئاوەدانییەکانی دیجلە، بەسرە، ئەهواز و فارسی خستە ژێر فەرمانی ئەو. فەرمانی پێدان بەنوێنەرایەتی خۆی یارکوج، لەجیاتی سەعید کوڕی ساڵح وەك فەرمانڕەوای بەسرە، ئاوەدانییەکانی دیجلە، بەحرەین و یەمامە. یارکوج بەنوێنەرایەتی خۆی، مەنسور کوڕی جەعفەری خەیاتی کردە فەرمانڕەوای بەسرە و ئاوەدانییەکانی دیجلە تا کەنارەکانی ئەهەواز.

## چۆنیەتی شکستی زەنگییەکان لەسەر دەستی سەعیدی حاجب ( پەردەدار )

لەرەجەب/ مەی ئەم ساڵە سەعیدی حاجب لەگەڵ سوپایەك دژی زەنگییەکان جەنگی و شکستی پێهێنان. ژنان و سامانە تالآن کراوەکانی لەوان سەندەوە. سەعید لەم جەنگەدا بریندار بوو. هەواڵی شکستی زەنگییەکان بەدەستەیەکی دیکە لەوان گەیشت. ئەوان بۆ جەنگی سەعید بەرێکەوتن بەڵام سەعید توانی شکست بەوانیش بێنێت و سامانە تالآن کراوەکانی لەوانیش سەندەوە. لەویٚ ژنێك دەبینرا کەزەنگییەکانی دەگرت و دەیبردنە ئوردووگاکەی سەعید. سەعید ڕێگەی ئەم کارەی لیٚ نەدەگرت.

سەعید لەهوتە (هەتە) ئوردووی لێدا. دواتر بەرەو ڕۆژئاوای دیجلە بەرێکەوت و چەندین جار ڕووبەڕووی ساحەبی زەنج بوویەوە. دواتر بۆ ئوردووگاکەی خۆی لەهوتە گەڕایەوە. ئەو لەدووی ڕەجەب/ ٢٧ مەی و تا کۆتایی شەعبان/ ژوئەن

لەوێ مایەوە.

## رزگاری کوڕی مودەبیر لەدەست زەنگییەکان

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی مودەبیر لەزیندانی زەنگییەکان رزگاری بوو. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو ئەو لەماڵی یەحیا کوڕی محەممەدی بوحرانی زیندانی کرابوو. دوو کەس چاودێری ئەویان دەکرد. ماڵی ئەم دوو پاسەوانە لەنزیك ئەو ماڵە بوو کەئیبراهیمی تیا زیندانی کرابوو. ئیبراهیم بەڵێنی پارەی پێدان و ئەوانی فریودا. ئەم دوانە تا ماڵەکەی ئیبراهیم تونێلێکیان هەڵکەند و بەم شێوەیە ئەو و برازاکەی بەناوی باوکی غالب و پیاوێکی هاشمی رزگاریان بوو.

## چۆنیەتی شکستی سەعید لەزەنگییەکان و فەرمانڕەوایی مەنسور کوڕی جەعفەر لەبەسرە

لەم ساڵەدا، ساحەبی زەنج لەگەڵ سەعید جەنگی. سەعید سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کردبوو. لەشەودا شەڕ دەستی پێکرد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی سەعید کوژران و زەنگییەکان خوێنی زۆریان ڕشت. ئەوان ئوردووگای سەعیدیان سووتاند. سەعید و سوپاکەی ناتەوان بوون. سەعید فەرمانی بەسوپاکەیدا بۆ بارەگای خەلیفە بگەڕێنەوە. ساحەبی زەنج هاتە ناو فوراجی بەسرە. سەعید لەبەسرەوە بەرێکەوت. ساحەبی زەنج لەفوراج پارێزگاری لەکەسەکانی دەکرد. خەلیفە دوای سەعید کاروبارەکانی بەمەنسور کوڕی جەعفەری خەیات سپارد. مەنسور پێشتر سەرکردەی کەشتییەکان بوو. ئەو مەنسوری بۆ بەسرە نارد و زەنگییەکان گرفتاری کەمی خواردەمەنی بوون. مەنسور ژمارەیەکی زۆر کەشتی کۆکردەوە وبۆ جەنگی ساحەبی زەنج بەرێکەوت. ساحەبی زەنج بۆسەی نایەوە. کاتێك مەنسور لێیان نزیك بوویەوە، لەناو حەشارگەکانی خۆیان هاتنەدەر و ژمارەیەکی زۆریان لەسوپاکەی مەنسور کوشت و ژمارەیەك لەناو ئاودا خنکان. سەری براوی سوپاکەی مەنسور و زەنگییەکانی ناو سوپاکەی ئەو، بۆ لای بوحرانی لەکەنار رووباری مەعقەل ڕەوانە کرا.

## شکستی سوپای زەنگییەکان لەئەهواز

لەم ساڵە، ساحەبی زەنج سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی عەلی کوڕی ئەبان بۆ بڕین و وێران کردنی پردی ئەربوك ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە ڕووبەڕووی سوپاکەی ئیبراهیم کوڕی سیما بوویەوە کە لەفارس دەگەڕایەوە. ئیبراهیم شەڕی لەگەڵ سوپاکەی ساحەبی زەنج کرد و شکستی پێهێنان. ژمارەیەك لەوانی کوشت. عەلی کوڕی ئەبان بریندار بوو.

دواتر سوپاکەی ئیبراهیم بەرەو ڕووباری جی بەرێکەوت. ئەو فەرمانی بەشاهین کوڕی بێستامی دەبیریدا لەرێگەیەکی دیکەوە خۆی بگەیێنێتە ڕووبارەکە. ئەم فەرمانە دوای جەنگ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبان بوو. عەلی کوڕی ئەبان دوای جەنگ لەخوینزورانییە ئوردووی لێدا. پیاوێك ئاگاداری کردەوە کەشاهین بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوتووە. ئەو ڕووبەڕووی شاهین بوویەوە. هەر دوو سوپا دوای نیمەڕۆ لەنێوان ڕووباری جەی و ڕووباری موسا ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. زەنگییەکان بەهەموو هێزیانەوە جەنگان. شاهین شکستی خوارد و خۆی و کوڕە مامەکەی و ژمارەیەکی دیکە کوژران.

کاتێك زەنگییەکان کۆتاییان بەجەنگ هێنا، ئاگادار بوونەوە کەئیبراهیم کوڕی سیما لەوان نزیك دەبێتەوە. عەلی کوڕی ئەبان بۆ جەنگی ئەو غاریدا و لەکۆتاییەکانی ئێواریْ ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. ئەم جارەیش شەڕێکی قورس ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر کوژران.

عەلی کوڕی ئەبان وتی: دوای جەنگ لەگەڵ شاهین هاوەڵانی من بڵاوبوونەتەوە و لەجەنگ لەگەڵ ئیبراهیم، تەنیا پەنجا کەسم لەگەڵدا بوو. عەلی بۆ لای ڕووباری جەی گەڕایەوە.

## زاڵبوونی ساحەبی زەنج لەبەسرە

کاتێك سەعید لەبەسرە بانگ کرایەوە، دەسەلأت، ئەرکەکانی ئەوی بەمەنسور کوڕی جەعفەری خەیات سپارد. مەنسور چیتر درێژەی بەجەنگ نەدا و تەنیا بەپارێزگاری کردنی کەشتییەکان بەسەندەی کرد. خەڵکانی بەسرە بەم کارەی ئەو رازی نەبوون. ئەم کارەی مەنسور بۆ ساحەبی زەنج گران و دژوار بوو. ساحەبی زەنج، فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەباندا لەخەیزورانییە بمێنێتەوە و مەنسور بەجەنگەوە سەرقاڵ بکات و رێگەی نەدات کەشتییەکان بجووڵێنێت. مەنسور لەکەنارەکانی جەی و خەیزورانییە پاسەوانی لەکەشتییەکان دەکرد. عەلی، مەنسوری گرفتار کرد و خەڵکانی بەسرە گرفتاری قاتوقڕی و کەمی خواردەمەنی بوونەوە. هاوەڵأنی ساحەبی زەنج پێداگرییان دەکرد تا بەیانی و ئێواریٚ دەست لەجەنگ هەڵنەگرن.

لەمانگی شەوال/ ئۆگۆست، ساحەبی زەنج بڕیاریدا هاوەڵأنی کۆبکاتەوە و بڕواتە ناو بەسرە و لەسەر بنەمای ناتەوانی و بەربڵاوی خەڵکەکەی، بۆ وێران کردنی شارەکە هەوڵ بدات و گوندەکانی دەوروبەری وێران بکات. ساحەبی زەنج، فەرمانی بەمحەممەد کوڕی یەزیدی دارەمی و سوپاکەی ئەو لەبەحرەیندا بڕواتە لای عەرەبە بیابان نشینەکان و هێز لەوان کۆبکاتەوە. ئەو ژمارەیەکی زۆری لەوان کۆکردەوە. ئەوان لەقیندل ئوردوویان لێدا. ساحەبی زەنج، سلێمان کوڕی موسای شەعرانی بۆ لای ئەوان نارد و فەرمانی پێدا چۆنیەتی هێرش کردنە سەر بەسرە و جەنگ لەگەڵ خەڵکانی بەسرەیان فێر بکات. ئەو دەستەیەك لەعەرەبەکانی بیابانی خستە ژێر فەرمانی عەلی کوڕی ئەبان و فەرمانی پێدان لەکەنارەکانی مناڵەکی سەعید بڕۆنە ناو بەسرە. فەرمانی بەیەحیا کوڕی محەممەدی بوحرانیدا لەبەرابەر رووباری عودەی بڕواتە ناو شارەکە و پاشماوەی عەربەکانی بیابانی خستە ژێر فەرمانی ئەو.

یەکەم کەس جەنگی لەگەڵ خەڵکانی بەسرە دەست پێکرد، عەلی کوڕی ئەبان بوو. بوفراج لەو رۆژگارەدا لەبەسرە ژیانیٚ بەسەر دەبرد و سوپایەکی لەژێر فەرماندا بوو. بوفراج بۆ ماوەی دوو رۆژ جەنگا و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان

پەیوەستی بوون و هاوکارییان کرد.

یەحیا کوڕی محەممەد و سوپاکەی هێرشیان کردە سەر پردەکە و عەلی کوڕی ئەبان لەکاتی نوێژی هەینی حەڤدەی شەوال/ نۆی سێپتامبەر ڕۆشتە ناو بەسرە و لەهەمان هەینی ژمارەیەکی زۆری کوشت و شارەکەی سوتاند. شەو و ڕۆژێك لەم کارەی بەردەوام بوو. یەحیا لەبەرەبەبانی یەکشەممە گەیشتە ناو شارەکە و هێرشی کردە سەر فوراج و بەریە بەلاّم پاشەکشێیان پێکرد و هەمان ڕۆژ ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر یەحیا دووبارە هێرشی کرد و هاتە ناو شارەکە. سەربازەکان بلاّوەیان لێکردبوو. بەریە هەلاّتبوو. فوراج و هاوەلاّنی خۆیان لەجەنگ بەدوور گرت. ئیبراهیم کوڕی یەحیای موهەلیبی سەردانی کرد و داوای ئەمانی بۆ خەڵکانی بەسرە کرد. ئەویش ئەمانی پێ بەخشین. جاڕچی ئیبراهیم جاڕیدا: هەرکەس خوازیاری ئەمانە ڕووبکاتە ماڵەکەی ئیبراهیم.. خەڵکانی بەسرە هاتن بەشێوەیەك کۆلاّنەکانی لای ماڵەکەی لێوانلێو بوو لەخەڵکان. یەحیا کاتێك بینی کۆبوونەتەوە، ئەمەی بەدەرفەت زانی بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بلاّوەی لێنەکەن. فێڵی لێکردن و فەرمانی بەسوپاکەیدا کوشتاریان بکەن. دەنگی شمشێرەکان دەبیسترا و هەموان شایەتومانیان هێنابوویە سەرزمان. ئەم ژمارەی خەڵکە هەموویان کوژران و تەنیا ژمارەیەکی کەم ڕزگاری بوو. یەحیا هەمان ڕۆژ بۆ حەربییە گەڕایەوە.

عەلی کوڕی ئەبان ڕۆشتە ناو مزگەوتی هەینی شارەکە و سوتاندی. بەسرە لەچەند شوێنەوە بوو بەخۆراکی ئاگر. مێربەد و زەهران لەو شوێنانە بوون کەسوتێنران. ئاگر لەکێوێکەوە بۆ کێوێکی دیکە بڵێسەی دەسەند و بەلاّ و کارەسات قوڵتر دەبوو. خوێن و تالاّنی هەموو ناوچەکانی گرتەوە و هەرکەسێکیان بینی، کوشتیان. هەرکەس دەوڵەمەند بوو، سامانەکەیان لێدەستەند و دواتر دەیانکوشت، هەرکەس نەدار بووایە، دەست بەجێ خوێنیان دەڕشت. بارودۆخی بەسرە بۆ چەند ڕۆژێك بەم شێوەیە بوو.

دواتر یەحیا ئەمانی بەخشی بەلاّم کەس نەهاتەدەر. ساحەبی زەنج ئاگادار

بوویەوە. ئەو عەلی کوڕی ئەبانی لەبەسرە لابرد و یەحیای هێشتەوە چوونکە ئەو خوازیاری کوشتن و خوێن ڕشتن بوو. ئەو عەلی کوڕی ئەبانی لابرد چوونکە خەڵکانی بەسرەی بەزیندووی دەهێشتەوە. خەڵکان بێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە، هەڵدەهاتن و ساحەبی زەنج سوپاکەی لەبەسرە کێشایەوە.

کاتێك ساحەبی زەنج بەسرەی وێران کرد، ڕەچەڵەکی خۆی بۆ یەحیا کوڕی زەید گەڕاندەوە چوونکە دەستەیەك لەعەلەوییەکان ڕەچەڵەکیان دەگاتە ئەو. عەلی کوڕی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی زەید و دەستەیەك لەژنەکانیان لەناو ئەواندا دەبینران. ئەو چیتر ڕەچەڵەکی خۆی بۆ عیسا کوڕی زەید نەدەگەڕاندەوە و خۆی پەیوەستی یەحیا کوڕی زەید دەکرد. قاسم کوڕی حەسەنی نەوفلی دەڵێت: ئەو درۆی کردووە چوونکە کوڕی یەحیا تەنیا کچێکی بوو و لەتەمەنی منداڵیدا مرد.

## هێرشی مەولەد بۆ جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان

لەزیقەعدە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە، موعتەمید، فەرمانی بەئەحمەد مەولەد دا بۆ جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان بەرێکەوێت. ئەو بەرێکەوت و لەئوبولە ئوردووی لێدا. بەریە گەیشت و هاتنە ناو بەسرە. ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکانی بەسرە لەدەوری کۆبوونەوە. ساحەبی زەنج، یەحیا کوڕی محەممەدی بۆ جەنگی مەولەد ڕەوانە کرد. یەحیا کوڕی محەممەد بەرێکەوت و ڕووبەڕووی مەولەد بوویەوە. دوو سوپا بۆ ماوەی دە ڕۆژ جەنگان. سەرئەنجام مەولەد لەوێ ئارامی گرت و لەجەنگ ناتەوان بوو. ساحەبی زەنج فەرمانی بۆ یەحیا نارد تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر مەولەد و باوکی لەیسی ئیسفەهانی لەگەڵ چەند کەشتییەکی جەنگی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد. یەحیا بەشێوەیەکی لەناکاو و لەشەودا هێرشی کردەسەر. مەولەد شەوانە جەنگی دەستپێکرد و بەیانی ئەو ڕۆژە تا دوای نیمەڕۆ جەنگ بەردەوام بوو بەڵام سەرئەنجام هێزەکانی مولەد شکستیان خوارد و زەنگییەکان هاتنە ناو ئوردووگاکەی و تالآنیان کرد. یەحیا تا جامیدە شوێن مەولەد کەوت و خوێنی خەڵکانی ئەو گەڕەکەی ڕشت و هەموو گوندەکانی تالآن کرد. ژمارەیەکی

زۆری کوشت و دواتر بۆ رووباری مەعقەل گەڕایەوە.

## ڕۆشتنی یەعقوب بۆ فارس و زاڵبوونی ئەو لەبەلخ و شوێنەکانی دیکە.

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیس هێرشی کردە سەر فارس. موعتەمید حەزی نەدەکرد بەرەو ئەو ناوچەیە بڕوات. موەفەق لەفەرمان نامەیەك ئەوی وەك فەرمانڕەوای بەلخ، تەخارستان، سیستان و سند دیاری کرد. یەعقوب رازی بوو وگەڕایەوە و رێگەی بەلخ و تەخارستانی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە بەلخ، لەدەرەوەی شارەکە ئوردوی لێدا و نەوشادی وێران کرد. نەوشاد بینایەك بوو داود کوڕی عەباس کوڕی مابنجور لەدەرەوەی بەلخ دروستی کردبوو.

یەعقوب لەبەلخەوە رێگەی کابولی گرتەبەر و بەسەریدا زاڵ بوو. زەنبیل (کابول شای) گرت. نێردراوێکی لەگەڵ دیاری گرانبایی بۆ لای خەلیفە نارد. لەناویاندا چەندین بت دەبینرا کە لەکابول و شارەکانی دیکە بەدەستی هێنابوو. دواتر رێگەی بوستی گرتەبەر و بۆ ماوەی یەك ساڵ لەوێ مایەوە.

هۆکاری مانەوەی ئەوە بوو کاتێك مەبەستی ڕۆشتنی کرد، یەکێك لەسەرکردەکانی بینی کەباروبنەی خۆی پێچاوەتەوە، تورە بوو و وتی: پێش من توێشوی رێگە کۆدەکەنەوە؟ بەم شێوەیە لەرقدا بۆ ماوەی یەك ساڵ لەوێ مایەوە. دواتر گەڕایەوە بۆ سیستان و روویکردە هەرات و گەمارۆی خستە سەر شاری کەروخ و دەستی بەسەردا گرت. دوای ماوەیەك بەرەو بوشەنج بەرێکەوت و حسەین کوڕی تاهیر کوڕی حسەین کوڕی کەبیری گرفتار کرد. محەممەد کوڕی تاهیر کەسی بۆ لای یەعقوب نارد و داوای ئازادی حسەینی کرد. حسەین مامی محەممەد کوڕی تاهیر بوو بەلاّم یەعقوب رازی نەبوو و حسەین قۆلبەست لای ئەو مایەوە.

## زاڵبوونی حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی لەسەر گورگان

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی، فەرمانڕەوای تەبەرستان، مەبەستی گورگانی کرد و دەستی بەسەردا گرت. کاتێك هەواڵی ڕۆشتنی حەسەن بەرەو گورگان بەمحەممەد کوڕی تاهیر، فەرمانڕەوای خوراسان گەیشت، سوپای رازاندەوە و توێشو و تفاقی فراوانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بۆ پاراستنی گورگان ڕەوانەی کرد. کاتێك حەسەن نزیك بوویەوە، ئەو سوپایە خۆڕاگری نەکرد. حەسەن سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دەستی بەسەر گورگاندا گرت و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی محەممەد کوڕی تاهیری کوشت و سامانەکانی تالآن کرد.

بەم شێوەیە محەممەد کوڕی تاهیر لاواز بوو. ژمارەیەکی زۆر لەو شارانەی باجیان پێ دەدا شۆڕشیان کرد تا ئەو جێگەی تەنیا بەشێکی خوراسان لەژێر فەرمانیدا مایەوە. ئەو بەشەی مابوویەوە بارودۆخێکی سەقامگیری نەبوو و خەواریج خراپەکارییان دەکردە پیشە و ئەو نەیدەتوانی بەرپەرچیان بداتەوە. بەم شێوەیە یەعقوبی سەفار توانی دەست بەسەر خوراساندا بگرێت. چۆنیەتی ئەم کارە لەگێرانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٨٧٣/٢٥٩ بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ئەحمەد مەولەد، سەعد کوڕی ئەحمەد کوڕی سەعدی باهلی گرت. ئەو بەسەر بەتائیح زاڵبوو و لەرێگە، خراپەکاری کردبووە پیشە. ئەویان بردە سامەرا و حەوتسەد قامچیان لێدا و بەهۆیەوە مرد. جەستەی بێ گیانی ئەویان لەداردا.

فەزڵ کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا بەسیل ناسراو بەسەقلەبی (ئیسلاو) شۆڕشی کرد. پێیان دەوت سەقلەبی (لەبنەماڵەی پاشاکان بوو) چوونکە دایکی لەسەقلەبییەکان بوو. ئەو دژی

میخائیل کوڕی تەوفیل پاشای ڕۆم شۆڕشی کرد و کوشتی. میخائیل بیست و چوار ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. بەسیل پاشایەتی ڕۆمەکانی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا موعتەمید، میسر و سەرزەمینەکانی دەوروبەری بەیارکوج سپارد. ئەو، ئەحمەد کوڕی تولونی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف بێ هیچ ترسێك شاری ڕەی تالآن کرد و لەوێ ڕۆشت. حەسەن کوڕی زەیددی عەلەوی، فەرمانڕەوای تەبەرستان، قاسم کوڕی عەلی کوڕی قاسم کوڕی عەلی عەلەوی ناسراو بەبەدلیسی بۆ ئەو دیارە نارد. ئەو دەستی بەسەر شاری ڕەی گرت و بەشێوەیەکی خراپ لەگەڵ خەڵکەکەی هەڵس و کەوتی کرد. دەروازە ئاسنینەکانی شارەکەی هەڵکەند و ڕەوانەی حەسەن کوڕی زەیدی کرد. بۆ ماوەی سێ ساڵ بەم شێوەیە لەشارەکەدا مایەوە.

لەم ساڵەدا پیاوێکی خارجی دیکە بەناوی تەوق لەڕەچەڵەکی مناڵەکانی زوهەیر، دژی موساور ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و چوار هەزار کەس لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو مەبەستی ئەزرەمەی کرد و دژی خەڵکەکەی جەنگی و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. شمشێر بەدەست ڕۆشتە ناو شارەکە و کچێکی هەڵگرت و لەناو مزگەوتەکە پەردەی کچێنی هەڵگرت. حەسەن کوڕی ئەیوب کوڕی ئەحمەدی عەدەوی دەستەیەکی گەورەی کۆکردەوە و کوشتی و سەری بڕاوی ئەوی بۆ سامەرا نارد.

لەم ساڵەدا خزمەتکارەکانی محەممەد کوڕی خەفاجە، فەرمانڕەوای سیسیل (سەقەلییە) لەڕۆژی ڕۆشندا کوشتیان و کارەکەی خۆیان بەنهێنی هێشتەوە و خەڵکان بۆ ڕۆژی دواتر ئاگادار بوونەوە لەکاتێکدا بکوژەکانی، ڕێگەی هەلآتنیان گرتبووە بەر. شوێنیان کەوتن و سەرئەنجام هەموویان گیران و ژمارەیەکیان کوژران. کاتێك محەممەد کوژرا، محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەب (فەرمانڕەوای ئەفریقییە) ئەحمەد کوڕی یەعقوب کوڕی مەزا کوڕی سەلمەی لەجێگەی ئەو دانا بەلآم ڕۆژگاری ئەو درێژەی نەکێشا و لە٢٥٨/٨٧٢ زایینی کۆچی دوای کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عومەری عەبدی کۆچی دوایی کرد. ئەو لە ساڵی ٧٦٧/١٥٠ زایینی لەسامەرا چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی فەزڵ کوڕی عەباس کوڕی فەرەجی ریاشی، لوغەوی لەگەورەکانی ئەم زانستە کە لەئەسمەعی وکەسانی دیکە حەدیسی دەگێڕایەوە، مرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی خەتابی موسڵی لەزاناکانی فارس، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پەنجا و هەشتی کۆچی ( ٨٧٢ زایینی )

## چۆنیەتی کوژرانی مەنسور کوڕی جەعفەری خەیات

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی جەعفەری خەیات کوژرا. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك ساحەبی زەنج، لەکوشتاری خەڵکانی بەسرە دەستی هەڵگرت، فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەباندا بۆ جەنگی مەنسور کوڕی جەعفەر بەرێکەوێت کە لەو ڕۆژگارەدا فەرمانڕەوایەتی ئەهوازی دەکرد. مەنسور یەك مانگ لەبەرابەر ئەودا مایەوە. ژمارەی سەربازەکانی لەو کاتەدا کەم بوون. سوپاکەی عەلی ئەو کاتەی لەخەیزورانییە بوو، ڕووبەڕوویان بوویەوە.

دواتر ساحەبی زەنج، سەرکردەی زەنگییەکان، دوانزە کەشتی و زۆربەی هاوەڵانی خۆی بۆ هاوکاری عەلی نارد و فەرماندەیی ئەوانی بەباوکی لەیسی ئیسفەهانی سپارد و فەرمانی پێدا فەرمانبەری فەرمانەکانی عەلی بێت. کاتێك باوکی لەیس گەیشتە لای عەلی، ناسازگاری ئەوی دەست پێکرد و خۆپسەندی کردە پیشە. لەم کاتەدا مەنسور هات بەهەمان شێوە کەپێشتر بۆ جەنگ دەڕۆشت. باوکی لەیس، بێ وەرگرتنی مۆڵەت لەعەلی کوڕی ئەبان، ڕووی کردە گۆڕەپانی جەنگ و مەنسور شکستی پێهێنا و بەسەر هێزی ناو کەشتییەکانیشدا سەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەسپی پێست و ڕەش پێستەکانی کوشت. باوکی لەیس هەڵات و بۆ لای ساحەبی زەنج گەڕایەوە.

دواتر عەلی کوڕی ئەبان پێشەنگەکانی ڕەوانە کرد تا لەباروردۆخی مەنسور ئاگاداری بکەنەوە و خۆی شەوانە هێرشی کردە سەر یەکێك لەکارگوزارەکانی مەنسور لەکەرەنبا و ئەو و زۆربەی سوپاکەی کوشت و تاڵانی کرد و گەڕایەوە.

مەنسور ئاگادار بوویەوە. شەوانە بەرەو خەیزورانییە بەرێکەوت و عەلی کوڕی ئەبان ڕووبەڕووی بوویەوە و تا نیمەڕۆ بەجەنگ و هەرا سەرقاڵ بوون. دواتر مەنسور شکستی خوارد و سوپاکەی بڵاوەی لێکرد و ئەو لێیان جیابوویەوە. دەستەیەك لەزەنگییەکان خۆیان پێ گەیاند و هێرشیان کردەسەر. مەنسور جەنگا

بەڵام ڕمەکەی شکا و تیردانەکەی تیری تیا نەما. سوار ئەسپەکەی بوو بۆ ئەوەی لەرووبارەکە بوگزەرێت بەڵام کەوتە ناو ئاوەکە و توانای ڕۆشتنی نەبوو. چۆنیەتی کەوتنی بۆ ناو ئاوەکە بەم شێوە بوو یەکێك لەزەنگییەکان بینی مەنسور بەرەو رووبارەکە دەڕوات و دەیەوێت بپەڕێتەوە، لەبەر ئەمە ڕۆشتە ناو رووبارەکە و لەکاتی سوار بوونی مەنسور، جڵەوی ئەسپەکەی گرت و مەنسور کەوت و زەنگی دەستبەجێ کوشتی و هەموو کەل و پەلەکانی هەڵگرت. براکەی، خەلەف کوڕی جەعفەری و دەستەیەکی دیکە لەگەڵ مەنسوردا کوژران. یارکوج، هەموو ئەرك و پێگەکانی مەنسوری بەجەعفەری کوڕی مەنسور بەخشی.

## هێرشی باوکی ئەحمەد بۆ سەر زەنگییەکان و کوژرانی موفلیح

لەرەبیع الاوەل/ ژانویەی ئەم ساڵە، موعتەمید، میسر و قینسرین و شارەکانی دیکە خستە ژێر فەرمانی براکەی باوکی ئەحمەد و لەمانگی رەبیع الاخر/ فەوریە بۆ ئەو و موفلیح خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی نارد و هەردووکیانی بۆ جەنگی زەنگییەکانی بەسرە ڕەوانە کرد. موعتەمید خۆی باوکی ئەحمەدی بەرێکرد. باوکی ئەحمەد بەرەو بەسرە بەرێکەوت و لەگەڵ ساحەبی زەنج جەنگی دەستپێکرد.

هۆکاری ڕەوانە کردنی ئەو بۆ بەسرە کردەوەکانی ساحەبی زەنج بوو چوونکە خەڵکان بەناپەسەندیان دەزانی. سوپاکەی ئەحمەد بەئامادەیی تەواو بەرێکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی بەغداد هاوڕێیەتیان دەکرد.

وەك ئاماژەی پێدرا، عەلی کوڕی ئەبان لەجەی و یەحیا کوڕی محەممەدی بوحرانی لەگەڵ بەشی زۆری سوپای زەنگییەکان بەرەو رووباری عەباس بەرێکەوتن. ساحەبی زەنج لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی سوپاکەی مایەوە و ئەوان بەیانیان و ئێواران دەڕۆشتنە ناو بەسرە تا نیاز و پێداویستییەکانی خۆیان بەدەست بێنن. کاتێك سوپاکەی باوکی ئەحمەد لەکەنار رووباری مەعقەل ئوردووی لێدا، زەنگییەکان لەترسا لای ساحەبی زەنج کۆبوونەوە و ئەویان لەگەورەیی و ژمارەی زۆری سوپاکەی باوکی ئەحمەد ئاگادار کردەوە و پێیان وت تا ئێستا سوپایەکی لەو شێوە هێرشی نەکردۆتە

سەریان. ئەو دوو فەرماندەی لەسوپاکەی بانگ کرد و سەبارەت بەفەرماندەی سوپاکەی باوکی ئەحمەد پرسیاری کرد بەڵام ئەو دوانە نەیاندەناسی. ساحەبی زەنج ترسا و نەیتوانی خۆی راگرێت. دواتر کەسی بۆلای عەلی کوڕی ئەبان نارد و فەرمانی پێدا بۆ جەنگی سوپاکەی باوکی ئەحمەد بەرێکەوێت. لەرۆژی چوارشەممە هەژدەی جومادی الاوەل/ سێی ئاوریل، یەکێك لەسەرکردەکان هاتە لای و لەپێشڕەوی سوپاکەی باوکی ئەحمەد ئاگاداری کردەوە. ئەم سەرکردە پێی وت: ئەو سەرکردە بەساحەبی زەنجی وت ئایا لەناو شاسوارە ڕەش پێستەکان کەس نییە بتوانێت پاشەکشێیان پێ بکات بەڵام ساحەبی زەنج (لەتاو تورەیی) ئەوی بەدرۆزن زانی و جوێنی پێدا. فەرمانی پێدا لەناو زەنگییەکان جاڕ بدەن بۆ ئەوەی بۆ جەنگ بەرێکەون. هەموان بەرێکەوتن. لەم کاتەدا موفلیحیان بینی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوتووە. دوو سوپا رووبەڕووی یەك بوونەوە. موفلیح لەکاتێکدا سەرقاڵی جەنگ بوو، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو تیرێکی بەرکەوت. کەس نەیزانی کێ تیرەکەی هاویشت. تیرەکە لەجەستەی موفلیح چەقی. ئەو گەڕایەوە و سوپاکەی بڵاوەیان لێکرد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. سەرە بڕاوەکانیان لای ساحەبی زەنج کۆکردەوە. زەنجییەکان گۆشتی کوژراوەکانیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد. ئەسیرەکانیان هێنا و پرسیاری فەرماندەی سوپاکەیان لێکرد. ئەوان باوکی ئەحمەدیان وەك فەرماندەی سوپاکە ناساند. موفلیح بەهۆی برینی ئەو تیرەوە مرد. دواتر عەلی کوڕی ئەبان بۆ لای ساحەبی زەنج گەڕایەوە.

باوکی ئەحمەد بۆ ئۆبولە گەڕایەوە تا سەربازە هەڵاتووەکان کۆبکاتەوە. دواتر بەرەو رووباری باوکی ئەسەد بەرێکەوت. کاتێك ساحەبی زەنج زانی موفلیح چۆن کوژراوە و کەس خۆی وەك بکوژی ئەو نەناسێنێت، خۆی بەبکوژی ئەو ناساند. ئەمە زیاتر لەدرۆیەك نەبوو چوونکە ئەو گۆڕەپانی جەنگی نەبینی.

## چۆنیەتی کوژرانی یەحیا کوڕی محەممەدی بوحرانی

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی محەممەدی بوحرانی یەکێك لەفەرماندە دیارەکانی ساحەبی زەنج، ئەسیر کرا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێك ئەو بەرەو رووباری عەباس گەڕایەوە لەگەڵ سوپاکەی ئەسعجور*، فەرمانڕەوای ئەهواز، دوای مەنسور رووبەروو بوویەوە. هەرچەندە ژمارەی سوپاکەی ئەسعجور فراوانتر بوو، بەڵام تیرهاوێژە زەنگییەکان ژمارەیەکی زۆریان لێ بریندار کردن. یەحیا بۆ گەیشتن بەوان رووبارەکەی بڕی، سوپاکەی ئەسعجور هەڵاتن. یەحیا کەشتییەکانی ئەم سوپایەی تاڵان کرد کەلێوانلێو بوو لەخواردەمەنی. ئەوان لەرێگەیەکی جیاواز لەرێگەکەی عەلی کوڕی ئەبان بۆ لای ساحەبی زەنج گەڕانەوە چوونکە لەنێوان عەلی کوڕی ئەبان و یەحیا، ناسازگاری و رژدی هاتبووە ئاراوە.

یەحیا پێشەنگی سوپاییەکانی خۆی بۆ دیجلە نارد. ئەوان لەرێگە رووبەرووی سوپاکەی باوکی ئەحمەد موەفەق بوونەوە کەبەرەو رووباری ئەسەد دەڕۆشتن و بۆ لای عەلی کوڕی ئەبان گەڕانەوە و ئەویان لەهاتنی سوپاکەی باوکی ئەحمەد ئاگادار کردەوە. یەحیا لەهەمان رێگەی کەهاتبوو، گەڕایەوە و رێگەی رووباری عەباسی گرتەبەر. لەلێواری رووبارەکە کەشتییەکەی جەنگی بینی کەسوپای خەلیفەی لەهێرشی دوژمن دەپاراست. کاتێك یەحیا ئەمەی بینی، ترسا. سوپاکەیشی ترسان. لەبەر ئەمە لەبەلەمەکانیان دابەزین و بەهێواشی بەرووبارەکەدا ڕۆشتن. یەحیا و هاورێکانیان رووبەرووی زیاتر لەدە پیاو بوونەوە و شەڕیان لەگەڵ کردن. ئەوان تیریان بۆ هاویشتن و یەحیا لەسێ شوێنەوە بریندار بوو. دوای بریندار بوونی ئەو هاوەڵانی بڵاوەیان لێکرد. ئەویان نەناسی تا گرفتاری بکەن. یەحیا بەبریندارى خۆی بەیەکێك لەکەشتییەکان گەیاند.

سوپاکەی خەلیفە تاڵانییەکانیان لەزەنگییەکان وەرگرتەوە و کەشتییەکانیان گرت و خۆیان بەکەشتی زەنگییەکان گەیاند و سوتاندیانن. زەنگییەکان

---

* ئەگەری هەیە هەمان ئەسغجونی مێژووی تەبەری و هەمان جەعفەری کوڕی مەنسور بێت کەکوڕی ئەسیر لەبیری کردووە کەمێك پێش جەعفەر ئەوی ناساندووە. (وەرگێڕ)

لەرووناکایی رۆژ لەدەوری یەحیا بلاو بوونەوە. یەحیا کاتێك هەلاتنی ئەوانی بینی، سوار کەشتییەك بوو و بۆ چارەسەری برینەکانی پزیشکێکی لەگەڵ خۆی برد و بەرێکەوت. کەشتییوانەکان، کەشتییەکانی خەلیفەیان بینی و ترسان و یەحیایان بەبریندارى رزگار کرد. یەحیا بەدژواری بەرێگەدا دەرۆشت. پزیشکەکەی هاورێی رۆشت و سوپاکەی خەلیفەی ئاگادار کردەوە. ئەویان گرت و بردیانە لای باوکی ئەحمەد. باوکی ئەحمەد ئەوی هێنایە سامەرا. هەردوو دەست و قاچی ئەویان بڕییەوە و کۆتاییان بەژیانی هێنا. زەنگییەکان و ساحەبی زەنج بۆ ئەو گریان و شینیان کرد. ساحەبی زەنج بەزەنگییەکانی وتبوو: کاتێك یەحیا کوژرا، زۆر بۆ ئەو گریام، بەلام پێیان وتم مەرگ بۆ ئەو باشتر بوو چوونکە کەسێکی تەماحکار بوو.

## گەڕانەوەی باوکی ئەحمەد موەفەق بۆ سامەرا

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد موەفەق لەشوێنەکەی خۆی لەواست رۆشت. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك مەبەستی رووباری ئەسەدی کرد، نەخۆشی لەناو هاوەلانی بلاوبوویەوە و ژمارەیەکی زۆریان مردن. گەڕایەوە و لەهەمان شوێن مایەوە و فەرمانیدا کەرەستەکانی جەنگ تازە بکەنەوە و کەشتییەکان ئامادە و رۆژانەی سوپا بدەن وجارێکی دیکە هێرشی کردە سەر ساحەبی زەنج. فەرمانی بەدەستەیەك لەسەرکردەکاندا لەشوێنە تایبەتەکان لەرووباری باوکی خەسیب جێگیر بن. ئەو لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی سەربازەکانی مایەوە بەلام لەکاتی روودانی جەنگەکە زۆربەی سەربازەکان بەرەو رووباری باوکی خەسیب رۆشتن و باوکی ئەحمەد لەگەڵ ژمارەیەك لەسەربازەکان مایەوە. ئەو شوێنەکەی بەجێنەهێشت لەبەر ئەوەی نەکا زەنگییەکان چاوی تەماحی تێبڕن.

کاتێك زەنگییەکان لەژمارەی کەمی سەربازەکان ئاگادار بوونەوە، چاوی تەماحیان تێبڕی و هێرشیان کردەسەر. شەڕێکی سەختیان کرد و ژمارەیەکی زۆر کوژران و ژمارەیەکیش بریندار بوون. سەربازەکانی باوکی ئەحمەد ماڵی زەنگییەکانیان سووتاند و ژمارەیەکی زۆر لەژنە ئەسیرەکانیان رزگار کرد. لەم

کاتەدا زەنگییەکان هەموو توانای خۆیان بەکار برد و باوکی ئەحمەد بەباشی زانی خۆڕاگری نەکات و فەرمانی بەسەربازەکانیدا دەستبەجێ بڕۆنە ناو کەشتییەکان. زەنگییەکان جیاییان لەنێوان ژمارەیەك لەسەربازەکانی باوکی ئەحمەد و کەسانی دیکە دروست کرد. ئەو دەستەی جیابووبوویەوە بەهەموو هێزیانەوە رووبەرووی زەنگییەکان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن بەڵام سەرئەنجام هەموویان کوژران و سەری ئەوانیان بۆ لای ساحەبی زەنج نارد. ژمارەی کوژراوەکان سەد و دە کەس بوو. ئەم رووداوە بوێری ئەوانی زیادە کرد.

باوکی ئەحمەد موەفەق لەبادەئاوەرد لەناو سوپاکەی دابەزی و سەربازەکانی خۆی بۆ گەڕانەوە بۆ جەنگی زەنگییەکان کۆدەکردەوە کە لەرۆژێکی تۆفانی لەدەوروبەری ئوردووگاکەی ئاگر کەوتەوە و ژمارەیەکی زۆری سوتاند. ئەو رێگەی واستی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە واست، زۆربەی سەربازەکانی بڵاوەیان لێکرد. ئەو لەوێوە رێگەی سامەرای گرتەبەر و محەممەد کوڕی مەولەدی بۆ جەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج لەواست لەجیاتی خۆی دەستنیشان کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا نەخۆشی پەتا لەئاوەدانییەکانی دیجلە دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ئەو شارەی کوشت. لەبەغداد، واست، سامەرا و شوێنەکانی دیکە، نەخۆشی پەتا ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی کوشت.

لەم ساڵەدا سەر سەجارس لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەهاوەڵانی لەرۆم کوژران.

لەم ساڵەدا ئەردهەژێنێکی مەترسیدار سەیمەرەی (ناوچەیەك لەدیجلە لەنزیك بەغداد) لەرزاند و لەم رۆژەدا ئەردهەژێنێکی قورستر لەوەی یەکەم روویدا و بەهۆیەوە بەشێکی زۆری شارەکە وێران و دیوارەکان داڕمان و نزیکەی بیست هەزار لەژێر داروپەردووی وێرانییەکان، گیانیاندا.

هەروەها لەم ساڵەدا یارکوجی تورك لەمانگی رەمەزان/ ژوئیە مرد و باوکی عیسا کوڕی متوەکیل نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند. ئەو فەرمانڕەوا و دابەش کەری میسر بوو. دوای مەرگی ئەو، ئەحمەد کوڕی تولون کەجێگری فەرمانڕەوایی یارکوج

لەمیسر بوو، سەربەخۆیی بەدەست هێنا.

لەم ساڵەدا لەنێوان هاوەڵانی موسا کوڕی بوغا و هاوەڵانی حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی شەڕ روویدا و سوپاکەی حەسەن شکستی خوارد.

لەم ساڵەدا مەسروری بەلْخی دەستەیەك لەهاوەڵانی موساوری شاری ئەسیر کرد. مەسرور ڕێگەی بوازیجی گرتەبەر و لەوێ ڕووبەڕووی موساور بوویەوە و لەم بگرە وبێنەدا ژمارەیەك لەهاوەڵانی موساور ئەسیر کران. دواتر لەزیحەججە/ ئۆکۆتبەر مەسرور بۆ سامەرا گەڕایەوە و جەعلانی لەحەدیسیەی موسڵ وەك جێگری خۆی دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا زۆربەی خەڵك(حاجییەکان) لەترسی تینویەتی لەقەرعە گەڕانەوە بەڵام ئەو کەسانەی درێژەیان بەسەفەرەکەیاندا، تەندروست گەیشتنە ناو شاری مەککە.

فەزڵ کوڕی ئیسحاق کوڕی حەسەن لەم ساڵەد ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ حاجییەکان ئەنجامدا.

هەروەها لەم ساڵەدا سارانشینەکانی تکریت کەهاوکاری موساوری شارییان کردبوو، گرفتاری هێرشی سوپاکەی خەلیفە بوون.

لەم ساڵەدا مەسروری بەلْخی لەگەڵ کوردەکانی یەعقوبییە جەنگی و شکستیدان.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی واسڵ تەسلیم و ویلایەتی فارسی بەمحەممەد کوڕی حەسەن باوکی فەیاز سپارد.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەزەنگییەکان کەقازی ئەوان لەئابادان لەناویاندا دەبینرا، ئەسیر کران. ئەوان ڕەوانەی سامەرا کران و هەموویان کوژران.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی عەبدوللە کوڕی خالیدی زوهەلی نەیشابووری مرد. ئەو لەگەڵ بوخاری بەسەرهاتێکیان هەیە کە بەهۆی ڕژدی بردنەوە ستەمی لێکرد و ئێرە (ئەم کتێبە) شوێنێکی شیاو بۆ شرۆڤە کردنی ئەو بابەتە نییە.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی موعازی رازی وتارخوێن لەمانگی جومادی الاوەل/ مارس، کۆچی دوایی کرد. ئەو کەسێکی چاکەکار و خواپەرەست و هاونشینی کەسانی وەك باوکی یەزید و کەسانی دیکەی دەکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و پە نجا و نۆی کۆچی (٨٧٣ زایینی)

## چۆنیەتی ڕۆشتنە ناوەوەی زەنگییەکان بۆ ناو شاری ئەهواز

لەرەجەب/ مەی ئەم ساڵە، زەنگییەکان ڕۆشتنە ناو ئەهواز. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ساحەبی زەنج، عەلی کوڕی ئەبانی موهەلبی لەگەڵ سوپایەك کەیەحیا کوڕی محەممەدی بوحرانی و سلێمان کوڕی موسای شەعرانی لەگەڵدا بوو، بەرەو ئەهواز ڕەوانە کرد. فەرمانڕەوای ئەهواز دوای مەنسور کوڕی جەعفەر پیاوێك بوو بەناوی ئەسعجور. ئەو لەبەرێکەوتنی زەنگییەکان ئاگادار بوویەوە و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان بەرێکەوت. دوو سوپا لەدەشتی میسان ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. سوپاکەی ئەسعجور شکستی خوارد و سەیرەك (نەیزەك) کوژرا.. ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی ئەسعجور کوژران و ژمارەیەکی زۆریان خنکان. ئەسعجور خۆی خنکا و دەستەیەکی فراوان لەسوپاکەی ئەسیر کران کەحەسەن کوڕی هەرسیمە و حەسەن کوڕی جەعفەر لەناویاندا دەبینران. سەری بڕاوەکان و ئاڵاکان و ئەسیرەکان ڕەوانەی لای ساحەبی زەنج کرا. ئەو فەرمانی زیندانی کردنی ئەسیرەکانی دەرکرد. زەنگییەکان هاتنە ناو ئەهواز و لەوێ مانەوە و خراپەکارییان دەستپێکرد. تا هاتنی موسا کوڕی بوغا لەخراپەکارییەکانی خۆیان بەردەوام بوون.

## بەرێکەوتنی موسا کوڕی بوغا بۆ جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان

لەزیقەعدە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە موعتەمید، فەرمانی بەموسا کوڕی بوغادا بۆ جەنگی ساحەبی زەنج بەرێکەوێت. عەبدولڕەحمان کوڕی موفلیحی بۆ ئەهواز و ئیسحاق کوڕی کونداجیقی بۆ بەسرە و ئیبراهیم کوڕی سیمای بۆ بادئاوەرد ڕەوانە کرد و فەرمانی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ساحەبی زەنجی پێدان.

کاتێك عەبدولڕەحمان فەرمانی پێدرا، بۆ جەنگی عەلی کوڕی ئەبان ئەسپی غاردا بەڵام دوای جەنگ، جەنگی دۆڕاند. ئەو دووبارە خۆی ئامادە کرد و بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕایەوە و بەشێوەیەك هێرشی کرد کەژمارەیەکی زۆر

لەزەنگییەکانی کوشت و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد. عەلی کوڕی ئەبان و زەنگییەکانی دیکە هەڵاتن. عەلی کوڕی ئەبان بڕیاریدا زەنگییە هەڵاتووەکان بگەڕێنێتەوە بەڵام ئەوان لەترسی عەبدولرەحمان نەگەڕانەوە. کاتێك عەلی ئەمەی بینی، مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدان و ئەوان بۆ شارەکەی خۆیان و بۆ لای ساحەبی زەنج گەڕانەوە.

عەبدولرەحمان ڕۆشتە قەڵای حیسنی مەهدي بۆ ئەوەی لەوێ ئۆردوو لێ بدات. ساحەبی زەنج، عەلی کوڕی ئەبانی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. عەلی ڕووبەڕووی عەبدولرەحمان بوویەوە بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. عەلی لەگەڵ سوپاکەی ڕوویکردە ناوچەیەك بەناوی دەکە. ئیبراهیم کوڕی سیما لەبادئاوەرد بوو. عەلی کوڕی ئەبان ڕووبەڕووی بوویەوە و شکستی پێهێنا. دوو سوپا بۆ جاری دووەم جەنگیان ئەزمون کرد بەڵام ئەم جارە ئیبراهیم شکستی بەعەلی هێنا. عەلی شەوانە و لەگەڵ ڕێنیشاندەرەکان لەناو دارستانەکانەوە بەڕێکەوت تا گەیشتە ڕووباری یەحیا.

عەبدولرەحمانیان ئاگادار کردەوە، ئەو تاشتمەری لەگەڵ دەستەیەك لەموالییەکان بەدوای عەلی کوڕی ئەباندا نارد بەڵام بەهۆی دژواری ڕێگە و بوونی گوزەرگەکان کەلێوانلێو بوو لەقامشی و ئاڵف، نەیتوانی بیگرێت. بەم شێوەیە عەبدولرەحمان هەمو گژ و گیاکەی سووتاندو هاوەڵانی عەلی هەڵاتن و خۆیان دەرباز کرد. عەبدولرەحمان ژمارەیەك لەوانی ئەسیر کرد و هاوەڵانی عەبدولرەحمان، سەرکەوتوو و لەگەڵ ئەسیرەکان گەڕانەوە.

دواتر عەبدولرەحمان بەرەو ناوچەیەك بەڕێکەوت کەعەلی کوڕی ئەبان لەوێ ئۆردووی لێدابوو. عەلی نامەیەکی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و داوای هاوکاری کرد. ساحەبی زەنج سیانزە کەشتی بۆ هاوکاری ئەو نارد. عەبدولرەحمان گەیشت و هەمان ڕۆژ دوو سوپا ڕووبەڕوی یەکبوونەوە. کاتێك شەو داهات، عەلی دەستەیەك لەکەسانی بڕواپێکراوی خۆی هەڵبژارد و شەوانە بەڕێکەوت و سوپاکەی بەجێهێشت تا کەس هەست بەمەبەستەکەی نەکات. دواتر لەپشتەوە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر سوپاکەی عەبدولرەحمان بەڵام تەنیا

سەرکەوتنێکی کەم بایی بەدەست هێنا. عەبدولرەحمان roویکردە دۆلاب و لەوێ مایەوە.

تاشتمەر خۆی بەعەلی کوڕی ئەبان گەیاند و جەنگی دەستپێکرد. عەلی بۆ رووباری سەدرە هەڵات. تاشتمەر هەواڵی هەڵاتنی ئەوی بۆ عەبدولرەحمان نووسی و داوای هاوکاری زیاتری کرد. عەبدولرەحمان خۆی پێگەیاند و لەرووباری سەدرە هێرشێکی گەورەیان بۆ سەر عەلی دەستپێکرد. عەلی بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ لای ساحەبی زەنج هەڵات. عەبدولرەحمان لەبێلونبان ئوردووی لێدا. ئەو وئیبراهیم کوڕی سیما بەنۆرە هێرشیان دەکردە سەر سوپاکەی ساحەبی زەنج. ئیسحاق کوڕی کینداجیق لەبەسرە بوو و رێگەی نەدەدا خواردەمەنی بەزەنگییەکان بگات. ساحەبی زەنج سوپاکەی کۆکردەوە و رۆژێك لەگەڵ عەبدولرەحمان و رۆژێك لەگەڵ ئیبراهیم جەنگی ئەزمون دەکرد. کاتێك جەنگ کۆتایی پێهات، ساحەبی زەنج دەستەیەکی بۆ بەسرە نارد تا رووبەرووی ئیسحاق ببنەوە. بۆ ماوەی دە مانگیان بەم شێوەیە بەسەر برد تا ئەوەی ئەرکی فەرماندەیی جەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج لەموسا کوڕی بوغا بەمەسروری بەڵخی سپێردرا و مەسروریان وەك فەرماندەی جەنگ دەستنیشان کرد. ساحەبی زەنجیان لەم گۆڕانکارییە ئاگادار کردەوە.

## دەست گرتنی یەعقوب بەسەر نەیشابوور

لەشەوال/ جولای ئەم ساڵە، یەعقوب کوڕی لەیس هاتە نەیشابور. هۆکاری ڕۆشتنی ئەو بۆ نەیشابور ئەمە بوو: عەبدوللە سێجزی لەسیستان ناسازگاری یەعقوبی دەکرد و کاتێك یەعقوب، بەسەریدا سەرکەوت، پەنای بۆ محەممەد کوڕی تاهیر برد. یەعقوب کەسی نارد تا کوڕی تاهیر ئەو بگەڕێنێتەوە بەڵام کوڕی تاهیر ئەو کارەی نەکرد. لەبەر ئەمە یەعقوب مەبەستی نەیشابوری کرد وکاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە و ویستی بڕواتە ناو شارەکە، محەممەد کوڕی تاهیر خوازیاری بینینی ئەو بوو، بەڵام یەعقوب مۆڵەتی پێنەدا. محەممەد کوڕی تاهیر مامەکان و بنەماڵەکەی نارد و ئەوان چاویان بەیەعقوب کەوت.

یەعقوب لەمانگی شەوال/ جولای ڕۆشتە ناو نەیشابور. محەممەد کوڕی تاهیر

بەسواری ڕۆشتە خێوەتەکەی. یەعقوب بۆ کەمتەرخەمی لەکارەکانی سەرکۆنەی کرد و دواتر خۆی و بنەماڵەکەی دەستبەسەر کرد و کارگوزارێکی دیکەی بۆ نەیشابور دانا. یەعقوب کەسی بۆ بارەگای خەلیفە نارد و لەکەمتەرخەمییەکانی کوڕی تاهیر بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان ئاگاداری کردەوە و ئەوەی کەخەڵکانی خوراسان داوایان لێ کردەوە (لەیەعقوب) تا بڕواتە لایان. ئەو باسی زاڵبوونی عەلەوییەکانی کرد لەتەبەرستان و لەمبارەوە درێژدادڕی کرد. ئەم کارەی ئەو بەقێزەون لەقەڵەمدرا وداوایان لێکرد لەوەی دەیهێنێتە سەرزمان، میانڕەو بێت وگەرنە ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ دەگرنەبەر.[٦]

دەڵێن: هۆکاری زاڵبوونی یەعقوب لەنەیشابور، ناتەوانی محەممەد کوڕی تاهیر، فەرمانڕەوای خوراسان بووە کە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٨٧١/٢٥٧ زایینی ئاماژەی پێدرا کە لەو کاتەدا فەرمانڕەوای خوراسان هیچ هێز و دەسەلاتێکی نەبوو و کاتێك یەعقوب ئاگادار بوویەوە لەوەی ئەو ناتوانێت بەرگری بکات، خۆی ڕێگەی نەیشابوری گرتەبەر. ئەو نامەیەکی بۆ محەممەد کوڕی تاهیر نووسی و بەم شێوەیە ئاگاداری کردەوە کەبۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خەلیفە سەبارەت بەحەسەن کوڕی زەید مەبەستی ڕۆشتن بۆ تەبەرستانی هەیە چوونکە حەسەن دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرتبوو و لەم ڕێگەدا لێکۆڵینەوە لەکاروباری ئەو و بنەماڵەکەی ناکات.

دەستەیەك لەکەسە نزیکەکانی محەممەد کوڕی تاهیر و چەند کەسێك لەبنەماڵەکەی، کاتێك بەدبەختی و چارەڕەشی محەممەدیان بینی، پەیوەستی یەعقوب بوون و نامەیان بۆ نووسی وئەویان بۆ هاتن بۆ نەیشابور هانداو لەلایەکی دیکە کارەکانی یەعقوبیان لەبەرچاوی محەممەد سووك و کەم بەها لەقەڵەمدا و ئاگاداریان کردەوە کە لەلایەن یەعقوبەوە ترسی لەسەر نییە. محەممەد کوڕی تاهیر فریوی وتەکانی ئەوانی خوارد تا ئەوەی یەعقوب لەنەیشابور نزیك کەوتەوە و یەکێك لەسەرکردەکانی خۆی نارد و ئارامی کردەوە و وتی: ئەگەر مەبەستی ڕۆشتن لەنەیشابورت هەیە، خۆڕاگربە.

---

[٦] – دەقی تێبەکە ڕوون نییە و لەچەند شوێنێك بابەتەکە ئاڵۆزە (وەرگێڕ)

یەعقوب لەچواری شەوال/ چواری ئۆگۆست، گەیشتە نەیشابور و براکەی، عەمرۆ کوڕی لەیسی بۆ لای محەممەد کوڕی تاهیر نارد و ئەوی بۆ بارەگاکەی خۆی بانگ کرد. دواتر گرتی و دەستبەسەری کرد و، بۆ کەمتەرخەمی لەکارەکانی سەرکۆنە و بۆ پاراستنی فەرمانڕەوایەتییەکەی بەناتەوانی لەقەڵەمدا. یەعقوب هەموو کەسانی بنەماڵەکەی محەممەد کوڕی تاهیری کرد کەژمارەیان سەد و شەست کەس بوو. دەستی بەسەر خوراساندا گرت و کارگوزارەکانی خۆی بۆ هەموو ناوچەکانی خوراسان ڕەوانە کرد.

فەرمانڕەوایی محەممەد کوڕی تاهیر یانزە ساڵ و دوو مانگ و دە ڕۆژ درێژەی کێشا.

## دەرکەوتنی دووبارەی کوڕی سۆفی لەمیسر

لەم ساڵەدا کوڕی سۆفی عەلەوی جارێکی دیکە لەمیسر شۆڕشی کرد. ئێمە چۆنیەتی شۆڕش و هەڵاتنی ئەومان لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٢٥٦/٨٧٠ زایینی باس کرد. دواتر ئەو پێشنیاری پەیوەست بوون بەخۆی بەخەڵکان دەکرد. ژمارەیەك شوێنی کەوتن. ئەوانی بەرەو ئەشمونین برد. بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو سوپایەك بەفەرماندەیی کوڕی باوکی غەیس ڕەوانە کرا و سوفی عەلەوی ئەوی بەسەرقاڵی جەنگ لەگەڵ عەبدولڕەحمانی عومەری بینی کەچۆنیەتییەکەی باس دەکەین.

کاتێك عەلەوی لەعومەری نزیك بوویەوە، دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا ڕوویدا و سەرئەنجامی جەنگەکە بەهەڵاتنی عەلەوی کۆتایی هات. ئەو هەڵاتوو بۆ ئوسوان پاشەکشێی کرد و لەوێ ڕێگەی خراپەکاری گرتەبەر و بڕێکی زۆری دارخورماکانی بڕییەوە. کوڕی تولون سوپایەکی دیکەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان لەهەر شوێنێك بێت، عەلەوی بدۆزنەوە و بیگرن. سوپاکە شوێنی کەوت و ئەو هەڵات و خۆی گەیاندە عەیزاب و بۆ گەیشتن بەمەککە، لەدەریا گوزەری کرد. هاوەڵانی لەدەوری بڵاو بوونەوە. کاتێك گەیشتە مەککە، فەرمانڕەوایی مەککەیان لەبوونی ئەو ئاگادار کردەوە. فەرمانڕەوا

ئەوی گرت و زیندانی کرد. دواتر بۆ لای کوڕی تولون ڕەوانەی کرد. کاتێك گەیشتە میسر، کوڕی تولون فەرمانیدا ئەو لەناو شارەکەدا بسوڕێنن، دواتر بۆ ماوەیەك لەزینداندا رایگرت و ئازادی کرد. سۆڤ عەلەوی بۆ مەدینە گەڕایەوە و تا کاتی مردن لەو شارە مایەوە.

## سەرئەنجامی باوکی عەبدولرەحمانی عومەری

پێشتر سەبارەت بەباوکی عەبدولرەحمانی عومەری بەناوی عەبدحەمید کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی عەبدوللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب قسەمان کرد.

هۆکاری یاخی بوونی ئەو لەمیسر ئەمە بوو: نەتەوەی بیجات رۆژی جەژن ڕۆشتنە ناو شار و تالآنییەکان کرد و کوشتیان و بەکۆکردنەوەی تالآنییەکان تەندروست گەڕانەوە. باوکی عەبدولرەحمانی عومەری لەرێگەی خواوەند و موسوڵمانان ئالآی شۆرشی بەرز کردەوە و لەسەر رێگەی ئەوان بۆسەی دانا. کاتێك ئەوان گەڕانەوە، خۆی نیشاندا و رێبەر و هاورێیانی ئەوانی کوشت و ڕۆشتە ناو سەرزەمینەکەیان و تالآنی کرد و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. سامانەکانیان کۆکردەوە و ژمارەیەکیانی ئەسیر کرد کە لەژماردن نایەت. تا ئەو جێگەی تالآنی کردن کە بەدانی باج رازی بوون. ئەوان پێشتر هەرگیز باجیان نەدابوو.

عومەری پێگەی بەرز بوویەوە و شوێنکەوتەکانی زیادیان کرد. کاتێك کوڕی تولون هەواڵی ئەوی بیست، سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. عومەری هاتە پیش و بەفەرماندەی سوپاکەی وت: بیٚ هیچ گومانێك کوڕی تولون لەراستی شۆڕشەکەی من ئاگادار نییە، من بۆ خراپەکاری ئالآی شۆڕشم بەرز نەکردۆتەوە و هیچ موسوڵمانێك یا ئەهلی زەممە، زیانی لەدەستی من نەبینیوە، بۆ ئەوە شۆڕش دەکەم تا وەك جیهاد لەقەڵەم بدرێت. تۆ نامەیەك بۆ کوڕی تولون بنووسە و لەکارەکانی من ئاگاداری بکەرەوە. ئەگەر فەرمانی گەڕانەوەی پێدایت، بگەڕێرەوە و ئەگەر فەرمانەکەی جیاواز بوو، پاساو و بەڵگەی شیاوت هەیە. فەرماندەی سوپا رازی نەبوو و لەسەر جەنگ پێداگری کرد بەڵام سوپاکەی کوڕی

تولون شکستی خوارد. کاتێك سوپاکە گەڕایەوە بۆ لای کوڕی تولون، لەکارەکانی عومەری ئاگاداریان کردەوە، وتی: باشتر بوو منتان ئاگادار دەکردەوە، ئەو بەهۆی ستەمکاری ئێوە و دوور کردنەوەی ستەم لەخۆی سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەمەی وت و ئەوانی بەجێهێشت.

دواتر دوو کۆیلە لەکۆیلەکانی عومەری دژی ئەو شۆڕشیان کرد و خوێنیان ڕشت و سەری ئەویان بۆ لای ئەحمەد کوڕی تولون نارد. کاتێك ئەم دوو کۆیلە گەیشتنە بارەگای ئەحمەد، سەبارەت بەهۆکاری کوشتنی ئەو، پرسیاریان لێکرا، لەوەڵامدا وتیان: دەمانویست بەم کارە خۆمان لەئێوە نزیك بکەینەوە. کوڕی تولون فەرمانی کوشتنی هەردووکیانی دەرکرد.دواتر فەرمانیدا سەری عومەری بشۆن و کفنی بکەن و دفنی بکەن.

## ڕووداوەکانی ئاندۆلۆس لەم ساڵەدا

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمانی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، هێرشی کردە سەر تۆلدۆ و گەمارۆی خستەسەر. دانیشتوانی تۆلدۆ ڕێگەی ناسازگارییان دژی ئەو گرتبووە بەر. بەدوای گەمارۆدانی تۆلدۆ، خەڵکەکەی داوای ئەمانیان لە محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کرد. محەممەد ئەمانی پێ بەخشین و چەندین کەسی وەك بارمتە وەرگرت.

لەم ساڵەدا خەڵکانی تۆلدۆ بۆ گرتنی قەڵای سەکیان، بەسوپایەکی دەهەزار کەسی هێرشیان کرد. حەوتسەد بەربەر لەو قەڵایەدا دەژیان. کاتێك جەنگ لەنێوان دوو سوپا دەستی پێکرد، یەکێك لەفەرماندەکانی خەڵکی تۆلدۆ بەناوی عەبدولرەحمان کوڕی حەبیب هەڵات. هۆکاری هەڵاتنی ئەم فەرماندەیە، دوژمنایەتی ئەو لەگەڵ یەکێك لەفەرماندەکانی دیکە بوو بەناوی تەریشە. حەبیب مەبەستی ئەوەی کرد هێزی تەریشە لەناو ببات. بەدوای هەڵاتنی عەبدولرەحمان، خەڵکانی تۆلدۆ هەڵاتن و بەمشێوەیە، بەربەرەکان بەرقیلیان کوشت.

هەروەها لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عەمروس دوای چەندین ساڵ ناسازگاری دووبارە ملکەچی فەرمانەکانی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان بوون. محەممەد

کوڕی عەبدولرەحمان، ئەمشەقەی خستە ژێر فەرمانی ئەو. محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، قەڵاکانی منالەکانی موسای گەمارۆدا و دواتر بەرەو بەنبەلونە بەرێکەوت و ئەو ناوچەی وێران کرد و گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەموسوڵمانان بەرەو ساراگوزا بەرێکەوتن. خەڵکی ئەم شارە بەو مەرجە لەگەڵ موسوڵمانان پەیمانی ئاشتیان بەست کەسێسەد و شەست ئەسیرە موسوڵمانەکە ئازاد بکرێن. ئەوان ئەسیرەکانیان ئازاد کرد و موسوڵمانان ئەوانیان بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا کەیجور کوژرا. چۆنیەتی کوژرانەکەی بەم شێوە بوو: ئەو فەرمانداری کوفە بوو و بێ هیچ مۆڵەتێك ڕێگەی سامەرای گرتەبەر. فەرمانی گەڕانەوەی پێدرا بەڵام ئەو رازی نەبوو. پارەیان بۆ نارد تا لەناو هاوەڵانی دابەشی بکات بەڵام رازی نەبوو. ئەو ڕۆشت وگەیشتە عوکبرا. چەند سەرکردەیەك لەسامەراوە بەرێکەوتن و خوێنیان ڕشت و سەری ئەویان بۆ سامەرا نارد.

هەروەها لەم ساڵەدا شەرکوبی حەمار [٧] دەستی بەسەر مەرو و ناوچەکانی دەوروبەری گرت و ئەم ناوچانەی تالان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیس لەبەلخ گەڕایەوە و لەقەهستان مایەوە. ئەو کارگوزارانی خۆی بۆ هەرات، بوشەنج و بادغەیس ڕەوانە کرد و بۆ سیستان گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا عەبدوڵلەی سێجزی لەیەعقوب خۆی بەدوور گرت و گەمارۆی خستە سەر نەیشابور. محەممەد کوڕی تاهیر لەو شارەدا بوو. ئەم ڕووداوە پێش ئەوە بوو کەیەعقوب دەست بەسەر نەیشابوردا بگرێت. محەممەد کوڕی تاهیر نوێنەر و فەقیهەکانی بۆ لای عەبدوڵلە نارد. ئەوان هاتوچۆیان دەکرد و نێوەنجیگەر بوون تا ئەوەی محەممەد کوڕی تاهیر حکومەتی تەبسەسین و قەهستانی بەعەبدوالله

---

[٧] لەمێژوی تەبەری بەجەمال ناوی هاتووە. (وەرگێڕ)

بەخشی (ئەو گەمارۆی سەر شارەکەی شکاند. بەڵام دواتر یەعقوب نەیشابوری گرت و محەممەد کوڕی تاهیری ئەسیر کرد)

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەید دەستی بەسەر قومسدا گرت و سوپاکەی ڕۆشتنە ناو شارەکە.

لەم ساڵەدا لەنێوان محەممەد کوڕی فەزڵ کوڕی بەیان (لەتەبەری: سەنان) و وەهسوزان کوڕی جوستانی دەیلەمی جەنگ ڕوویدا و وەهسوزان شکستی خوارد.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان ڕۆشتنە ناو سومەیسات و دواتر مەڵتییە و لەگەڵ دانیشتوانی ئەم شارە جەنگان بەڵام ڕۆمییەکان شکستیان خوارد و بەتریق (سوپاسالاری گەورەی ئەوان) کوژرا.

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەر کوڕی سلێمان کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس، ناسراو بەبەریە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی موسا، باوکی عەبدوللە کوڕی باوکی زەکەریای ئەسفەراینی، ناسراو بەحەیویە و محەممەد کوڕی عەمروس کوڕی یوسن کوڕی عیمران کوڕی دیناری کوفی سەعلەبی، کۆچی دواییان کرد. سەعلەبی یەکێکە لەو شیعانەی حەدیسەکانی لاوازە.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حەربی تائی موسڵی حەدیس بێژ مرد. باوکی حەدیسی لەو دەگێڕایەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەستی کۆچی ( ٨٧٤ زایینی )

### چۆنیەتی ڕۆشتنی یەعقوب بۆ تەبەرستان

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیس لەگەڵ حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی جەنگا و شکستی پێ هێنا و ڕۆشتە ناو تەبەرستان.

هۆکارەکەی ئەوە بوو عەبدوڵڵەی سیجزی لەسەر فەرمانڕەوایەتی سیستان رکابەری یەعقوبی دەکرد. یەعقوب سەرکەوتنی بەدەست هێنا و عەبدوڵڵە بۆ نەیشابور هەڵات و کاتێك یەعقوب ڕۆشتە نەیشابور، عەبدوڵڵە بۆ لای حەسەن کوڕی زەید لەتەبەرستان هەڵات. یەعقوب شوێنی کەوت. حەسەن کوڕی زەید لەگوندی ساری ڕووبەڕووی یەعقوب بوویەوە. یەعقوب پەیکی بۆ لای حەسەن نارد و داوای لێکرد عەبدوڵڵەی رادەست بکاتەوە و بۆ جەنگی ئەو خۆی ئامادە نەکات چوونکە مەبەستی ئەو گرتنی عەبدوڵڵەیە نەك جەنگ لەگەڵ ئەو. حەسەن رازی نەبوو و یەعقوب جەنگی دەست پێکرد. حەسەن شکستی خوارد و بەرەو ساری و دەیلەم هەڵات. یەعقوب هاتە ناو ساری و ئامول و باجی یەکساڵی لەدانیشتوانەکەی سەند و دواتر بۆ گرتنی حەسەن بەرێکەوت و گەیشتە چەندین بەش لەکێوەکانی تەبەرستان بەڵام لەوێ بۆ ماوەی چل ڕۆژ باران باری. یەعقوب بەدژواری زۆر توانی خۆی رزگار بکات و زۆربەی چوارپێ کانی لەناوچوون. یەعقوب مەبەستی ئەوەی کرد تا کوێستانەکانی دەیلەم شوێن حەسەن بکەوێت بەڵام لەرێگەدا گەیشتە تەنگەبەر کەرێگەیەکی سەخت و نارێك بوو. یەعقوب وەستا و فەرمانی دابەزینی بەسوپاکەیدا. ئەو خۆی ڕۆشتە پیش و بەوردی سەیری رێگەکەی کرد. دواتر گەڕایەوە و فەرمانی گەڕانەوەی بەسوپاکەیدا و وتی: ئەگەر جگە لەم تەنگەبەرە رێگەیەکی دیکە بوونی دەبوو، دەڕۆشتین بەڵام هیچ رێگەیەك بۆ پێشڕەوی نییە.

ژنەکانی ئەو دیارە بەپیاوەکانیان وت: رێگەیان بدەن بەم رێگەدا بێت کەئەگەر هات، ئێوە لەو ئاسوودە دەکەین و ئەسیر کردنی ئەو بۆ ئێوە لەئەستۆی ئێمە.

یەعقوب کاتێك لەتەبەرستان ڕۆشتەدەر، بەناو سوپاکەیدا گەڕا و بینی چل هەزار کەس لەوان دیارنین ( کوژرا بوون) زۆرینەی ئەسپەکان و وشترەکانی ئەوان لەناوچووبوون. چۆنیەتی شکستدانی حەسەنی بۆ خەلیفە نووسی. دواتر بەمەبەستی گرتنی عەبدوللە درێژەی بەڕێگەدا چوونکە عەبدوللە دوای شکستی حەسەن بەرەو ئەو ناوچەیە بەڕێکەوتبوو. کاتێك یەعقوب لەرەی نزیك کەوتەوە، نامەیەکی بۆ سەلانی فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە نووسی و سەرپشکی کرد لەوەی عەبدوللەی رادەست بکات و یەعقوب ئەو ناوچەیە بەجێبێلێت یا خۆی بۆ جەنگ ئامادە بکات. ئەو عەبدوللەی بەیەعقوب سپارد و یەعقوب ناوچەکەی بەجێهێشت و دواتر عەبدوللەی کوشت.

## چۆنیەتی شۆڕش لەموسڵ و لابردنی کارگوزارەکەی

خەلیفە موعتەمید، عەلی الله ئیسکاتینی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دیاری کرد. ئەو یەکێك لەگەورەترین سوپاسالارەکانی تورك بوو. ئیسکاتین، ئەزکوتکینی کوڕی بەنوێنەرایەتی خۆی وەك فەرمانڕەوای موسڵ ڕەوانە کرد. ئەمە لەجومادی الاوەلی ساڵی ٢٥٩/ مارسی ٨٧٣ زایینی ڕوویدا. لەنەورۆزی ئەم ساڵە لەسیانزە نیسان/ سیانزەی سەفەر، بیستی دێسامبەر (موعتەزید بالله گۆڕانکاری لەم ڕۆژەدا دروست کردبوو)، ئەزکوتکین، گەورەکان و سەرکردەکانی موسڵی لەگونبەدێك لەناو گۆڕەپانی شار کۆکردەوە و کەرەستەکانی رابواردنی هێنا، سفرەی ڕاخست و شەرابی خواردەوە، هاوەڵانی بەئاشکرا خراپەکارییان دەکرد و بەشێوەیەکی خەڵك لەگەڵ خەڵکان جووڵانەوە.

لەم ساڵەدا سەرما بەرادەیەك سەخت بوو سەری دارەکان، سەرما بردبووی و میوە و گەنم و جۆ دەست نەدەکەوت. قات و قڕی هەموانی گرتبوویەوە. ئەزکوتکین لەگەڵ ئەمەیشدا باجی لەخەڵکان وەرگرت و بەو حاڵەیش لەوەرگرتنی باج زێدەڕۆیی دەکرد و بۆگرتنی باجی دانەوێڵە (کەبوونی نەبوو) پێداگری کرد و تەنگی پێهەڵچنین. ئەمە بۆ خەڵکان دژوار بوو. ئەگەر حیلەی ئەسپێکی ببیستایە، لەخاوەنەکەی زەوت دەکرد. خەڵکانی موسڵ خۆڕاگرییان دەکرد تا ئەوەی پیاوێك

لەهاوەڵانی ئەزکوتکین پەلاماری ژنێکیدا و ڕێگەی لێ گرت. ژنەکە خۆی بەدەستەوە نەدا و هاواری کرد. لەم کاتەدا پیاوێك بەناوی ئیدریسی حەمیری کەقورئان خوێنێکی چاکەکار بوو، ژنەکەی لەدەستی ئەو ڕزگار کرد. سەربازەکە هاتە لای ئەزکوتکین و لەکردەوەی ئەو پیاوە سکاڵای کرد. ئەزکوتکین ئەو پیاوەی بانگ کرد و بێ ئەوەی پەردە لەسەر ڕاستیەکان هەڵگرێت، قامچی بارانی کرد. سەرکردەکانی موسڵ لەمزگەوتی هەینی کۆبوونەوە و بەخۆیان وت: بۆ وەرگرتنی سامان و جوێندانی بێهۆ و بەسووك زانینی ئایین و ستەمکاری ئەوان خۆڕاگر بووین، هەنووکە دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنەکانی ئێمە. هەموان بڕیاریاندا ئەزکوتکین لەشارەکە دەربپەڕێنن و خەلیفەیان ئاگادار کردەوە.

ئەزکوتکین لەجموجۆڵی ئەوان ئاگادار بوویەوە و بەسوپاکەی خۆی هێرشی کردە سەریان. خەڵکانی موسڵ ڕووبەڕووی بوونەوە و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. خەڵکانی موسڵ ئەویان لەشارەکە دەرکرد و ماڵەکەیان تاڵان کرد. ئەزکوتکین بەردێکی بەرکەوت و بریندار بوو. هەمان ڕۆژ بەرەو شارەکەی گەڕایەوە و لەوێوە ڕێگەی سامەرای گرتەبەر.

خەڵکانی موسڵ یەك هەڵوێست بوون تا یەحیا کوڕی سلێمان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژێرن. یەحیا ڕازی بوو. ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا ئەوەی ساڵی دووسەد و شەست تێپەڕی. لەساڵی دووسەد و شەست و یەك، ئەسکاتکین بۆ هەیسەم کوڕی عەبدوللە کوڕی مەعمەری تەغلەبی نامەیەکی نووسی و داوای لێکرد کاروباری موسڵ بگرێتە ئەستۆ. ئاڵا و خەڵاتی بۆ نارد.. هەیسەم کە لەسەرزەمینی ڕەبیعە بوو، سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و لەبەشی ڕۆژهەڵات ئوردووی لێدا. دیجلە دووری ئەوان لەموسڵ بوو. خەڵکانی موسڵ ڕووبەڕووی بوونەوە، بەناچاری ئەو ڕووی کردە بەشی ڕۆژئاوا و هێرشی کردە سەر دەروازەی شارەکە.

یەحیا کوڕی سلێمان لەخەڵکانی موسڵ، مەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوی کرد. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ژمارەیەکی فراوان لەهەر دوو لا کوژران و ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون. هەیسەم دەستی لەجەنگ هەڵگرت.

ئسکاتکین، ئیسحاق کوڕی ئەیوبی تەغلەبی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دیاریکرد و ئەو لەگەڵ سوپایەکی بیست هەزار کەسی کەحەمدان کوڕی حەمدون لەناویاندا دەبینرا، بۆ جەنگی خەڵکانی موسڵ بەرێکەوت و لەدێری ئەعلا ئوردووی لێدا. خەڵکانی موسڵ ڕووبەڕووی بوونەوە و ڕێگەی ڕۆشتنە ناو شارەکەیان پێنەدا. ماوەیەك بەم شێوەیە بەردەوام بوون تا ئەوەی یەحیا کوڕی سلێمان، نەخۆش کەوت و ئیسحاق دووبارە چاوی تەماحی بڕییە موسڵ و بەهەموو هێزی خۆیەوە هێرشی کردە سەر خەڵکەکەی. خەڵکان ڕێگەیان بۆ کردەوە. ئەو هاتە ناو موسڵ و گەیشتە چوارشەممە بازار و بازاری عەلافەکانی سوتاند. لەم کاتەدا یەکێك لەخواپەرستەکان بەناوی زیاد کوڕی عەبدولواحید هاتە ناو گۆڕەپانەکە لەکاتێکدا قورئانێکی بەملیەوە هەڵواسیبوو. موسوڵمانانی بۆ جیهاد هاندا و خەڵکانی موسڵ هەڵخڕان و بەمەبەستی جەنگ گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر ئیسحاق و سوپاکەی و ئەوانیان لەموسڵ دەرکرد.

هەواڵی ئەم شەڕ و پێکدادانە بەیەحیا کوڕی سلێمان گەیشت. فەرمانیدا و ئەویان خستە سەر تەختێك و لەپێشی ڕیزی جەنگاوەرانەوە دایاننا. کاتێك خەڵکانی موسڵ ئەویان بینی، ورەیان گرت و ئاگری شەڕەکەیان خۆش کرد. دوو سوپا بەم شێوەیە لەجەنگ بەردەوام بوون. ئیسحاق بەردەوام کەسی بۆ لای خەڵکانی موسڵ دەنارد و بەڵێنی ئەمان و چاکەکاری پێدەدان. خەڵکان ڕازی بوون بەوەی ئەو بڕواتە ناو شارەکە. ئەو هاتە ناو شارەکە و لەرەبز ئەعلا ئوردووی لێدا. ئیسحاق کوڕی موسڵ ڕۆشتە ناو شارەکە و بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ مایەوە.

دواتر لەنێوان هاوەڵانی ئیسحاق و دەستەیەك لەدانیشتوانی موسڵ ناسازگاری هاتە ئاراوە و دووبارە جەنگیان دەست پێکردەوە. خەڵکانی موسڵ ئیسحاقیان لەموسڵ دەرکرد و یەحیا کوڕی سلێمان، جڵەوی کارەکانی گرتەدەست.

## شەڕ لەنێوان تۆلدۆ و هەوارە

لەم ساڵەدا موسل کوڕی زی نون هەواری لەشەنت بەریە دەرکەوت و هێرشی کردە سەر خەڵکانی تۆلدۆ (تەلیتەڵە) و ڕۆشتە ناو قەلاێ وەلید. خەڵکانی تۆلدۆ لەگەڵ سوپایەکی بیست هەزار کەسی هاتنەدەر. کاتێك ڕووبەڕووی موسا بوونەوە و لەنێوان دوو سوپا جەنگ دەستی پێکرد، محەممەد کوڕی تەڕیشە و هاوەڵانی ئەو لەخەڵکانی تۆلدۆ هەلاتن. خەڵکانی تۆلدۆ شوێنی کەوتن. لەم کاتەدا موتەریف کوڕی عەبدولرەحمان هەلات. هەلاتنی محەممەد لەوەلام بۆ هەلاتنی موتەریف بوو کەساڵی پاڕ ئەوی بۆ هەلاتن ناچار کردبوو. لەم جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی تۆلدۆ کوژران و موسا کوڕی زی نون پێگەی بەرز بوویەوە و ناسازگاران لەرووبەڕوو بوونەوەی ئەو ترسان.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا پیاوێك لەهاوەڵانی موساوری شاری، محەممەد کوڕی هارون کوڕی مەعمەری کوشت. ئەو محەممەدی بینیبوو بەرەو سامەڕا دەروات، لەبەر ئەمە کوشتی وسەری بڕاوی ئەوی بردە لای موساور. هۆزی مناڵەکانی ڕەبیعە مەبەستی تۆڵەسەندنەوەی ئەویان کرد، لەبەر ئەوە داوایان لەمەسروری بەلخی و دەستەیەکی دیکە کرد ڕێگە لەموساور بگرن.

لەم ساڵەدا قات و قڕی لەشارە ئیسلامییەکاندا بلاو بوویەوە و نرخی کەل و پەلەکان بەرێژەیەکی بەرچاو زیادی کرد و ژمارەیەك لەخەڵکانی مەککە شارەکەیان بەجێهێشت. بەریەی فەرمانڕەوایش شارەکەی چۆڵ کرد. نرخی بارێك گەنم لەبەغداد بۆ سەد و بیست دینار بەرز بوویەوە. ئەم قات و قڕی و گرانییە بۆ ماوەی چەند مانگێك بەردەوام بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا عەرەبە بیابان نشینەکانی مەنجور، فەرمانڕەوای حیمسیان کوشت و بەکتەمەریان لەجێگەی ئەوردانیشاند.

هەروەها لەم ساڵەدا عەلا کوڕی ئەحمەدی ئەزدی کارگوزاری ئازەربایەجان

کوژرا. چۆنیەتی کوژرانەکەی بەم شێوە بوو: ئەو زەوی گیر بوو، خەلیفە، باوکی رودەینی عومەر کوڕی عەلی لەجێگەی ئەو دانیشاند. کاتێك رودەینی لەئازەربایەجان نزیك کەوتەوە، عەلا بۆ جەنگی ئەو خۆی ئامادە کرد. هەردووك جەنگان و عەلا کوژرا و سوپاکەی هەلاّتن. رودەینی دەستی بەسەر هەموو ئەو شتانەدا گرت لەعەلا بەجێمابووە کەبریتی بوو لەدوو هەزار هەزار و حەوتسەد هەزار درهەم.

ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل لەم ساڵەدا ریّ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەو فەرمانڕەوای مەککە بوو (بەریە)

لەم ساڵەدا لەمیسر پیاوێك بەنازناوی باوکی روەح و ناوی سەکەن، قووتبوویەوە. ئەو لەهاوەلاّنی کوڕی سۆق بوو. دەستەیەك لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو رێگەکانی بڕی و رێبوارەکانی ترساند. کوڕی تولون سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. باوکی روەح لەزەوییەك جێگیر بوو کەچاڵی فراوانی تیادەبینرا، گەنمی ئەو زەوییەیان دروێنە کردبوو و کای گەنمەکە بەشێوەیەك بەسەر زەوییەکەدا بلاّو بوویەوە کەچاڵەکانی داپۆشیبوو. خۆی و هاوەلاّنی ئاشنای ئەو زەوییە پرپێچ و پەنایە بوون. کاتێك سوپاکەی کوڕی تولون هات، باوکی روەح و سوپاکەی رووبەرووی بوونەوە بەلاّم سەرئەنجام سوپاکەی باوکی روەح شکستی خوارد و سوپاکەی کوڕی تولون شوێنیان کەوتن. لەم کاتەدا سمی ئەسپەکانی ئەوان لەچاڵەکان دەچەقی و ژمارەیەکی زۆری سوارەکان بەدەما کەوتن وسوپاکەی باوکی روەح گەڕانەوە و خوێنیان ڕشتن و پاشماوەی سوپاکە بەریسوایی هەلاّتن.

ئەحمەد کوڕی تولون سوپایەکی بۆ سەر رێگەی ئەوان لەئاوەدانییەکان نارد و سوپایەکی دیکەی بۆهەمان سەرزەمینی پڕچاڵ و چۆڵ ڕەوانە کرد. ئەو سوپایەی بۆ جەنگی ئەو هاتبوونە سەرزەمینەکەی، رووبەرووی بوونەوە. باوکی روەح پەنای بۆ ئەم چالاّنە بردبوو. سوپاکەی کوڕی تولون لەنزیك بوونەوەی ئەوان خۆی بەدوور گرت و ترسان لەوەی گرفتاری چارەنووسی سوپاکەی پێشوو بن. کاتێك باوکی روەح بینی سوپاکەی کوڕی تولون لەشوێنەکەی خۆی ناجووڵێت، لەگەڵ سوپاکەی ئەو ناوچەی بەجێهێشت. سوپاکەی کوڕی تولون شوێنیان کەوتن.

کاتێك باوکی روەح لەئاوەدانییەکان ڕۆشتنەدەر، ڕێگەکانی لەدەستدا. کەسی بۆ لای کوڕی تولون نارد و داوای ئەمانی کرد و پێی بەخشرا. جەنگ کۆتایی هات و موسوڵمانان لەبەلاّ و شەڕی ئەو ئاسوودە بوون.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی محەممەد کوڕی جەعفەری عەلەوی خەمانی کەدانیشتووی خەمان بوو، (بەناوی شارەکەوە بانگ دەکرا) کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی یەزید، فەرمانڕەوای کوفە، بەدەستی ساحەبی زەنج کوژرا.

لەم ساڵەدا لەئەفریقییە و سەرزەمینەکانی ئاندۆلۆس، قاتوقڕییەکی مەترسیدار دەرکەوت بۆ سەرزەمینەکانی دیکەیش تەشەنەی سەند. بەهۆیەوە پەتا و تاعوونێکی گشتگیر، گیانی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدوس، فەقیهی مالکی و نووسەری جنگی (جونگی) لەفقه کە لەخەڵکانی ئەفریقییە بوو، مرد.

لەم ساڵەدا مالك کوڕی تەوقی تەغلەبی لەو گۆڕەپانەی خۆی دروستی کردبوو و بەناوی تەغلەبی دەناسرا، کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ئیمام حەسەنی عەسکەری) مرد. ئەو بەپێی بڕوای شیعەکان یەکێکە لەدوانزە ئیمامەکەی ئەوان و باوکی محەممەدە. لەساڵی ٨٤٦/٢٣٢ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی عەلی حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی سەباحی زەعفەرانی، فەقیهی شافعی و لەهاوەڵانی بەغدادی شافعی، کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی ئیسحاق، حەکیمی پزیشك کەکتێبێکی حەکیمەکانی یۆنانی بۆ سەرزمانی عەرەبی وەرگێڕا، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەست و یەکی کۆچی ( ٨٧٥ زایینی )

### شەڕی نێوان محەممەد کوڕی واسڵ و کوڕی موفلیح

لەم ساڵەدا کوڕی واسڵ لەگەڵ عەبدولرەحمان و کوڕی موفلیح و تاشتمەر جەنگی ئەزمون کرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کوڕی واسڵ، حارس کوڕی سیمای کوشت و بەسەر فارسدا زاڵ بوو. موعتەمید (خەلیفە)، فارس و ئەهواز و بەسرە و بەحرەین و یەمامە و ناوچەکانی دیکەی بەموسا کوڕی بوغا سپارد. موسا، عەبدولرەحمان کوڕی موفلیح کەگەنجێکی بیست و یەك ساڵە بوو، بەرەو ئەهواز ڕەوانە کرد و ئەهواز و فارسی خستە ژێر فەرمانی ئەو. کاتێك کوڕی واسل بەمەی زانی کە کوڕی موفلیح مەبەستی ئەهوازی کردووە، لەفارسەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو سوپای ڕازاندەوە و دوو سوپا لەرامهورموز ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. باوکی داود سەعلوك (سالوك)ی شۆڕشی پەیوەستی کوڕی واسڵ بوو و جەنگ دەستی پێکرد. عەبدولرەحمان شکستی خوارد و ئەسیر کرا و تاشتمەر کوژرا. سوپای ئەو دوو سەرکردە بلاّو بوویەوە و ئەوەی توێشو و کەل و پەلی ناو ئوردووگاکەیان بوو، تالاّن کرا.

خەلیفە کەسی بۆ لای کوڕی واسڵ نارد تا عەبدولرەحمان ڕزگار بکات بەلاّم ئەو کارەی نەکرد و ئەوی کوشت و وای نیشاندا کەخۆی مردووە. کوڕی واسڵ دوای ئەم جەنگە رامهورموزی بەجێهێشت و مەبەستی ئەوەی کرد بەرەو واست و جەنگ لەگەڵ موسا کوڕی بوغا بڕوات. ئەو گەیشتە ئەهواز و ئیبراهیم کوڕی سیمای لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەو ناوچەیە بینی.

کاتێك موسا ئەم بارودۆخەی بینی و زاڵبوون بەسەر ئەوانی لەدەرەوەی توانای خۆی بینی، داوای دەست لەکار کێشانەوەی کرد و بەداواکەی ڕازی بوون.

## فەرمانڕەوای باوکی ساج لەئەهواز

لەم ساڵەدا باوکی ساج، ئەهوازی خستە ژێر فەرمانی خۆی و ئەمە لەدوای ئەوە بوو کە عەبدولرەحمانی موفلیح هێرشی کردە سەر فارس. فەرمانی جەنگ لەگەڵ زەنگییەکانیان بەباوکی ساج دا و ئەو زاواکەی خۆی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. عەلی کوڕی ئەبان لەکەنارەکانی دۆلاب رووبەروویان بوویەوە و عەبدولرەحمانی کوشت.

باوکی ساج بەرەو عەسکەری موکەرەم بەرێکەوت و زەنگییەکان ڕۆشتنە ناو شارەکە و دانیشتوانەکەیان کوشتار کرد و سوتاندیان و فڕاندیان.

بەدوای ئەم ئەنجامە، باوکی سلێمان لەجەنگ لەگەڵ زەنگییەکان خۆی بەدوور گرت و فەرمانڕەوایەتی ئەهوازی بەئیبراهیم کوڕی سیما سپارد. ئەو لەوێ مایەوە تا ئەوەی موسا کوڕی بوغا داوای دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لەو دیارە کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەوسی بەڵخی وەك پارێزەری ڕێگەی خوراسان دیاریکرا.

## گەڕانەوەی سەفار بۆ فارس و جەنگی ئەو لەگەڵ کوڕی واسڵ

کاتێك لەنێوان عەبدولرەحمان کوڕی موفلیح و کوڕی واسڵ (وەك ئاماژەی پێدرا) جەنگ روویدا، یەعقوب کوڕی لەیس لەسیستان ئاگادار بوویەوە و دووبارە چاوی تەماحی بڕییە سەرزەمینی فارس. بڕیاریدا سامان و گەنجینە و کەل و پەلەکانی جەنگ کەکوڕی واسڵ لەکوڕی موفلیحی سەندبوو، وەربگرێتەوە. لەبەر ئەمە بەخێرایی ملی ڕێگەی گرتەبەر.

هەواڵی نزیك بوونەوەی ئەو و ئەوەی لەبەیزای فارس ئوردووی لێداوە، بەکوڕی موفلیح گەیشت کە لەئەهواز بوو. ئەو بەخێرایی بێ ئەوەی سەرنج بەشتێکی دیکە بدات، بەرەو فارس ئەسپی غاردا. کوڕی واسڵ سەرەتا خاڵی خۆی، باوکی بیلالی مێرداسی بۆ لای سەفار نارد. ئەو ڕۆشتە بارەگای سەفار و بەنوێنەرایەتی کوڕی

واسڵ گوێڕایەڵی خۆی نیشاندا. یەعقوب نامە و نێردراوەکانی بۆ رازی بوون بەم داواکارییە بۆ لای کوڕی واسڵ نارد. کوڕی واسڵ نێردراوەکانی زیندانی کرد و بەردەوام شوێن یەعقوب دەکەوت و بەسەرهاتی نێردراوەکانی دەشاردەوە. بڕیاریدا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکاتە سەر یەعقوب و مافی خۆی لێ بسێنێت.

کوڕی واسڵ لەرۆژێکی گەرم و زەوییەکی نارێك هێرشی کرد و گومانی کرد یەعقوب ئاگادار نەبۆتەوە. کاتێك نیمەڕۆ دەستی پێکرد، چوارپێکانیان شەکەت و هەمووان دابەزین تا وچان بگرن. ژمارەیەکی زۆر لەپیادەکانی کوڕی واسڵ لەتینویەتی و شەکەتی مردن و یەعقوب ئاگادار بوویەوە. ئەو سوپاکەی کۆکردەوە و لەم پێشهاتە ئاگاداری کردنەوە و بۆ جەنگی کوڕی واسڵ بەرێکەوت. سەفار بەباوکی بیلالی وت: کوڕی واسڵ فێڵی لێکردین و خواوەند بۆ ئێمە بەسە چوونکە باشترین هاوەڵ وپشتیوانە. سەفار بۆ جەنگی کوڕی واسڵ پێشڕەوی کرد. کاتێك سەفار لێیان نزیك بوویەوە و سوپاکەی کوڕی واسڵ لەهاتنی ئەو، ئاگادار بوونەوە، ورەیان روخا و لەجەنگ و خۆڕاگری لاواز و چیتر پێشڕەوییان نەکرد. کاتێك دووری نێوان دوو سوپا تەنیا یەك تیر بوو، سوپاکەی کوڕی واسڵ بێ جەنگ شکستیان خوارد و سوپاکەی سەفار شوێنیان کەوتن و ئەوەی لەکوڕی موفلیحیان تالان کردبوو، تالانیان کرد و دەستیان بەسەر فارسدا گرت. سەفار کارگوزارەکانی خۆی لەوێ دانا و بارودۆخی ئەو دیارەی سەقامگیر کرد.

کوڕی واسڵ هەڵات و سامانەکەی خۆی کە چل هەزار درهەم بوو، لەقەڵاکەی هەڵگرت و ڕۆشت. یەعقوب لەگەڵ دانیشتوانی زەم کەپشتیوانی کوڕی واسڵیان کردبوو، جەنگی و بیری لەوە کردەوە دەسەڵاتی بەسەر ئەهواز و ناوچەکانی دیکە بڵاو بکاتەوە.

## کۆکردنەوەی سوپا لەلایەن باوکی ئەحمەد بۆ ڕۆشتنە ناو بەسرە

لەشەوال/ ژوئیەی ئەم ساڵە، موعتەمیدی خەلیفە، بۆ بینینی خەڵکان لەدار ئەلعامە دانیشت و جەعفەری کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و نازناوی مفوض الی اللەی پێبەخشی و موسا کوڕی بوغای خستە ژێر فەرمانی ئەو و فەرمانڕەوایەتی ئەفریقییە، میسر، شام، جەزیرە، شام، موسڵ، ئەرمەنستان و ڕێگەکانی خوراسان و مێهرجانقەزەقی پێسپارد. موعتەمید، باوکی ئەحمەدی برای وەك جێگری جەعفەر دیاری کرد و نازناوی (ناصر ئەلدین اللە الموفق)ی پێبەخشی و ڕۆژهەڵات زەمین، بەغداد، دەوروبەری بەغداد، کوفە، ڕێگەی مەککە و مەدینە، یەمەنی کەسکەر، ئاوەدانییەکانی دیجلە، ئەهواز، فارس، ئیسفەهان، قوم، کەرەج، رەی، زەنجان، سندی پێسپارد و بۆ هەرکام دوو ئاڵای بەست، یەکیان سپی و یەکیان ڕەش. بەڵێنی وەرگرت ئەگەر پێش گەنجییەتی جەعفەر، ڕۆژگاری ئەوی بردەوە، کاروبارەکان لەدەستی ئەودا بێت و دواتر تەسلیم بەجەعفەر بکرێتەوە. لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەتیان بۆ وەرگیرا.

جەعفەر، مەغریبی بەموسا کوڕی بوغا سپارد و موعتەمید، فەرمانی بەموەفەقدا جەنگی زەنگییەکان دەست پێبکاتەوە. موەفەق، ئەهواز، بەسرە و ئاوەدانییەکانی دیجلەی بەمەسروری بەڵخی سپارد و لەزیحەججە/ سێپتامبەر ئەوی کردە پێشەنگی سوپاکەی و بڕیاریدا دوای ئەو بەرێکەوێت بەڵام ڕووداوەکەی یەعقوبی سەفاری لەڕۆشتن پەشیمانی کردەوە. چۆنیەتی ئەم ڕووداوە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٨٧٦/٢٦٢ زایینی باس دەکەین.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی زەیدویە لەیەعقوب کوڕی لەیس جیابوویەوە و پەیوەستی باوکی ساج و لەگەڵ ئەو لەئەهواز نیشتەجێ بوو. موعتەمید خەلاتی بۆ نارد. ئەوداوای لەخەلیفە کرد حسەین کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەستنیشان بکات.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی ئیسحاق کوڕی حەسەن کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەباس

کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس ڕێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. حسەین کوڕی باوکی شەوارب دوای ئەنجامدانی حەج، لەمەککە مرد.

## فەرمانڕەوای نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی لەماوەرا ئەلنەهر

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەسەد کوڕی سامان خودا کوڕی جوسمان کوڕی تەمغاس کوڕی نوشەرد کوڕی بەهرامی چوبین کوڕی بوهرامی خوشنەس فەرمانڕەوایەتی پێبڕا. بەهرام خوشنەش لەڕەی بوو کەخوسرەو هورموز کوڕی ئەنەوشیروان ئەوی کردە سنورداری ئازەربایەجان. پێشتر کاتێك ڕووداوەکانی سەردەمی بەهرامی چوبینمان باس کرد، ئاماژەمان پێدا.

کاتێك مەئمون فەرمانڕەوایەتی خوراسانی گرتەدەست، مناڵەکانی ئەسەد کوڕی سامان کەنوح و ئەحمەد و یەحیا و ئەلیاس بوون، کاری پێسپاردن. مەئمون پێگەی ئەوانی بەرز کردەوە و وەك فەرمانده دەستنیشانی کردن. کاتێك مەئمون بۆ عێراق گەڕایەوە، غەسان کوڕی عیبادی وەك جێگری خۆی لەخوراسان دانا. غەسان لەم ساڵەدا /٢٠٤/٨١٩ زایینی سەمەرقەندی بەنوح کوڕی ئەسەد سپارد و فەرغانەی بەئەحمەد کوڕی ئەسەد و شاش (چیچەن) و ئەشروسنەی بەیەحیا کوڕی ئەسەد و هەراتی بەئەلیاس کوڕی ئەسەد سپارد.

کاتێك تاهیر کوڕی حسەین فەرمانڕەوایەتی خوراسانی گرتەدەست، ئەوانی لەم ناوچانە هێشتەوە. دواتر نوح کوڕی ئەسەد مرد و تاهیر کوڕی عەبدوللە دوو براکەی ئەو، یەحیا و ئەحمەدی لەجێگەی ئەو دانا. ئەحمەد کوڕی ئەسەد پیاوێکی داوێن پاك و کردەوەکانی پەسەند بوو و بەرتیلی وەرنەدەگرت بەو شێوەی هاوەڵانی وەریان دەگرت. ئەم هۆنراوەیان سەبارەت بەو و کوڕەکەی هۆنیوەتەوە.

ثوی ثلاثین حولا فی ولایته          فجاع یوم ثوی فی قبره حشمه

واتاکەی: سێ ساڵ لەسەرزەمینی خۆی ژیا و ئەو ڕۆژەی بەخاك سپێردرا، نۆکەرەکانی برسی بوون.

ئەلیاس فەرمانڕەوایەتی هەراتی دەکرد. ئەو چەندین منالّی لەو سەرزەمینەدا بوو و شوێنەوارێکی زۆری لەخۆی بەجێهێشت. عەبدوللە کوڕی تاهیر ئەوی بۆ بارەگای خۆی بانگ کرد. نەریتی وابوو هەر کاتێك کەسێکی بانگ دەکرد، ڕۆژەکانی تا هاتنی ئەو دەبژارد. ئەلیاس خۆی دواخست. عەبدوللە نامەی بۆ نووسی و پێی وت لەهەر شوێنێك نامەکەی بەدەست دەگات، لەویّ بمێنێتەوە. نامە کاتێك بەدەستی ئەلیاس گەیشت کە لەبوشەنجەوە بەرێکەوتبوو. ئەلیاس یەك سالّ لەویّ مایەوە. ئەمە وەك سزایەك بوو. دواتر مۆڵەتی هاتن بۆ بارەگاکەی پێدا.

کاتێك ئەلیاس لەهەرات مرد، عەبدوللە، کوڕەکەی ئەو باوکی ئیسحاق محەممەد کوڕی ئەلیاسی وەك جێگری باوکی دیاریکرد. ئەو، لەهەرات مایەوە.

ئەحمەد کوڕی ئەسەد حەوت کوڕی بۆ هاتە دنیا: نەسر، باوکی یوسف یەعقوب، باوکی زەکەریا یەحیا، باوکی ئەشعەس ئەسەد، ئیسماعیل، ئیسحاق و باوکی غانم حومەید. ئەحمەد کوڕی نەسر، نەسری کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. کاتێك ئەحمەد کوڕی ئەسەد مرد، کوڕەکەی نەسر، سەمەرقەند و دەوروبەری خستە ژێر دەسەلاّتی خۆی و تا کۆتایی ڕۆژگاری تاهیریەکان و دواتر وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە مایەوە. دواتر مرد.

ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد، خزمەتی نەسری برای دەکرد. نەسر لەسالّی ٨٧٥/٢٦١ زایینی ئەوی وەك فەرمانڕەوای بوخارا دەستنیشان کرد. مانای وتەی تەبەری کە لەسالّی ٨٧٥/٢٦١ زایینی نەسر کوڕی ئەحمەد وەك فەرمانڕەوای ماوەرا ئەلنەهر دەستنیشان کرا ئەوەیە لەلایەن خەلیفەوە ئەو فەرمانەی پێدرا و پێشتر لەلایەن فەرمانڕەوایانی خوراسانەوە ئەم ئەرکەی پیّ سپێردرابوو و منالّەکانی سامان پێش ئەم ڕۆژگارە فەرمانڕەوکانی ئەو سەرزەمینە بوون.

هۆکاری فەرمانڕەوای ئیسماعیل لەلایەن خەلیفەوە ئەوە بوو کاتێك یەعقوب کوڕی لەیس دەستی بەسەر خوراساندا گرت، نەسر سوپایەکی بەرەو ڕووباری جەیحون ڕەوانە کرد تا ڕێگە لەپێشڕەوی یەعقوب بگرێت بەلاّم سەربازەکان فەرماندەکەی خۆیان کوشت و بۆ بوخارا گەڕانەوە.. ئەحمەد کوڕی عومەر کە بەنوێنەرایەتی نەسر فەرمانڕەوایەتی بوخارای دەکرد، لەم سوپایە ترسا و خۆی

لەوان شاردەوە. سوپاکەی باوکی هاشم محەممەد کوڕی موبەشیر کوڕی رافیع کوڕی لەیس کوڕی سەیاری وەك فەرماندەی خۆیان دەستنیشان کرد. دواتر ئەویان لابرد و ئەحمەد کوڕی محەممەدی لەیس باوکی، باوکی عەبدوللە کوڕی جونەیدیان وەك فەرماندە هەڵبژارد، دواتر ئەویشیان لابرد و حەسەن کوڕی محەممەد لەمناڵەکانی عەبدە کوڕی حەدیدیان کردە فەرماندە، ماوەیەك دواتر ئەویشیان لابرد و بوخارا بێ فەرمانڕەوا مایەوە. گەورە و زانای ئایینی شارەکە باوکی عەبدوللە کوڕی باوکی حەفس نامەیەکی بۆ نەسر نووسی و داوای لێکرد کەسێك بۆ سەقامگیر کردنی بارودۆخی بوخارا ڕەوانە بکات. ئەویش براکەی خۆی، ئیسماعیلی نارد. دواتر ئیسماعیل لەگەڵ رافیع کوڕی هەرسیمەی فەرمانڕەوای خوراسان نامەی ئاڵو گۆڕ کرد و پەیمانیان بەست هاوکاری یەکتر بکەن. ئیسماعیل داوای ویلایەتی خوارەزمی لەرافیع کرد و رافیع ئەو ویلایەتی پێ سپارد.

ئیسماعیل لەنامەکانی خۆی رافیعی بەئەمیر ناو دەبرد بەڵام ئاژاوەچییەکان لەنێوان نەسر و ئیسماعیل قسەیان بڵاو کردەوە و ئاژاوەیان لەنێوان ئەواندا نایەوە. بەم شێوەیە نەسر لەساڵی ٢٧٢/ ٨٨٦ زایینی هێرشی کردە سەر ئیسماعیل. ئیسماعیل، حەمویە کوڕی عەلی بۆ لای رافیع نارد و داوای هاوکاری کرد. رافیع سوپایەکی گەورەی ڕەوانەی بوخارا کرد. حەمویە دەڵێت: بیرم دەکردەوە ئەگەر ئیسماعیل بەسەر براکەیدا سەرکەوێت چۆن لەئەماندا دەبین کەرافیع ئیسماعیل نەگرێت و دەسەڵاتی بەسەر ماوەرا ئەلنەهر بڵاو نەکاتەوە، ئەگەر ئەو کارە نەکات و رێز لەئیسماعیل بگرێت، ئیسماعیل بەردەوام خۆی بەقەرزاری رافیع دەزانێت و بەناچار دەبێت بەهەموو شتێکی ئەو رازی ببێت. لەبەر ئەمە بەتەنیا لەگەڵ رافیع دانیشتم و پێم وت: چاکەخوازی تۆ بۆ من ئەرکێکی پێویستە. هەموو نهێنییەکانی نەسر و ئیسماعیل بۆ من دەرکەوتووە. ئەو دوانە بەئەمینی تۆ نازانم. بۆچوونی راست ئەوەیە خۆت لەم جەنگە بەدوور بگریت و ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر بکەیت. رافیع رازی بوو و هەردوولا بەئاشتی سازان. رافیع گەڕایەوە.

حەمویە دەڵێت: دوای ماوەیەك ئەم بەسەرهاتەم بۆ ئیسماعیل باس کرد و ئەو پەسەندی کرد. نەسر و ئیسماعیل بۆ ماوەیەك بەم شێوە بەردەوام بوون تا دووبارە ئاژاوەچییەکان ئاژاوەیان نایەوە و سەرئەنجام لەساڵی ٢٧٥/ ٨٨٩ زایینی جەنگان و ئیسماعیل سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کاتێك نەسریان هێنایە لای ئیسماعیل، ئیسماعیل لەئەسپەکەی هاتەخوار و دەستی براکەی ماچ کرد و ئەوی بۆ سەمەرقەند گەڕاندەوە و خۆی بەجێگری ئەو لەبوخارا لەقەڵەمدا.

ئیسماعیل چاکەکار بوو، زانا و پیاوانی ئایینی خۆش دەویست و بەهۆی ئەوانەوە بوو ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی خۆی و منداڵەکانی درێژەی کێشا.

باوکی فەزڵ، محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی بەلعەمی دەڵێت: لەئەمیر، باوکی ئیبراهیم، ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدم بیست کەدەیوت: لەسەمەرقەند بووم. ڕۆژێك بۆ دادخوازی خەڵکان دانیشتم و ئیسحاقی برام لام دانیشت. لەم کاتەدا باوکی عەبدوڵلە محەممەد کوڕی نەسر، فەقیهی شافعی هاتە ژوور. بۆ ڕێز گرتن لەو و زانستەکەی هەستام. کاتێك ڕۆشت، ئیسحاقی برام سەرکۆنەی کردم و وتی: تۆ فەرمانڕەوای خوراسانیت و کاتێك یەکێك لەمسکێنەکان دێتە لای تۆ، لەشوێنی خۆت هەڵمەستە چوونکە جڵەوی کاروبارەکانت لەدەست دەردەچێت.

ئیسماعیل دەڵێت: ئەو شەوە کاتێك خەوتم، پێغەمبەرم لەخەودا بینی. بەشێوەیەك بوو وەك بڵێی من و ئیسحاقی برام وەستابووین. پێغەمبەر(د.خ) هاتە پێش و بازووی گرتم و فەرمووی: ئەی ئیسماعیل، فەرمانڕەوایی خۆت و بنەماڵەکەت بەرێز گرتن لە محەممەد کوڕی نەسر پایەدار بکە، دواتر ڕووی کردە ئیسحاق و فەرمووی: فەرمانڕەوایی تۆ و بنەماڵەکەت لەبەر سووکایەتی کردن بە محەممەد کوڕی نەسر بەفیڕۆ چوو.

محەممەد کوڕی نەسر لەفەقیهەکانی ئایینی شافعی بوو. زانستەکەی خۆی بەکار دەبرد و چەندین کتێبی نووسی. بۆ کۆکردنەوەی زانست، چەندین سەرزەمین گەڕا. لەیونس کوڕی عەبد عەلا لەهاوەڵانی شافعی و لەرەبیع کوڕی سلێمان و محەممەد کوڕی عەبدوڵلە، زانست فێر بوو. هاونشینی حارسی موحاسبی بوو. حارس زانستی دان و سەندنی فێر کرد. نەسر لەم زانستەیشدا

پێگەی بەرز بوویەوە.

## یاخی بوونی خەڵکانی بەرەقە

لەم ساڵەدا خەڵکانی بەرەقە دژی ئەحمەد کوڕی تولون شۆڕشیان کرد و فەرمانڕەواکەیان، محەممەد کوڕی فەرەجی فەرغانیان لەشارەکە دەرپەڕاند. کوڕی تولون سوپایەکی بەفەرماندەیی کۆیلەکەی بەناوی لۆلۆ بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا سەرەتا ڕێگەی ئاشتی بگرێتەبەر و نەرمی بنوێنێت، ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکان بوون، چ باشتر و جیاواز لەوە شمشێر بەکار بێنێت.

سوپا بەرێکەوت و گەیشتە بەرقە و گەمارۆی خەڵکەکەیدا و بەو شێوەی فەرمانی پێدرابوو، سەرەتا ڕێگەی سازانی گرتەبەر. ئەمە بووە هۆی دروست بوونی تەماح لای خەڵکی ئەو دەڤەرە. لەبەر ئەمە ڕۆژێك هێرشیان کردە سەر سوپاکە کە لای دەروازەی شارەکە ئوردوویان لێدابوو. چەند کەسێك لەسوپاکەیان کوشت.

لۆلۆ ئەم هەواڵەی بۆ ئەحمەد کوڕی تولون نارد و ئاگاداری کردەوە. ئەحمەد فەرمانی پێدا بۆ جەنگ دژی ئەوان هەموو هێز و توانای خۆی بەکار ببات. لۆلۆ مەنجەنەیقەکانی بەکار بەست و بەرادەیەك بوێرانە جەنگا کەخەڵکەکەی بەناچاری داوای ئەمانیان کرد و ئەمانی پێ بەخشین. ئەوان دەروازەکەیان کردەوە و لۆلۆ ڕۆشتە ناو شارەکە و دەستەیەك لەگەورەکانی ئەوانی گرت و قامچی بارانی کردن. دەستی دەستەیەکی بڕییەوە و دەستەیەکی وەك ئەسیر لەگەڵ خۆی برد و بۆ میسر گەڕایەوە و کارگوزارێکی بۆ بەرقە دانا.

کاتێك لۆلۆ گەیشتە میسر، ئەحمەد خەڵات و دیاری پێشکەش کرد کەدوو گەردنبەند لەناویاندا دەبینرا. ئەو گەردن بەندەکانی لەمل کرد و ئەسیرەکانی بەناو شاردا سوڕاند.

## فەرمانڕەوایی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد لەئەفریقیە

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەب، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، لەمانگی جومادی الاوەل/ فەوریە مرد. ئەو بیست و پێنج ساڵ و پێنج مانگ و شانزە رۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد.

لەسەرەمەرگدا، کوڕەکەی، باوکی عێقالی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و کاروبارەکانی بەدەستی ئیبراهیمی برای سپارد تا رێگەی ناسازگاری لەگەڵ منداڵەکەی نەگرێتەبەر و بنەماڵەی ئەغلەب و پیرەکانی قیروانی کردە شایەت. فەرمانی پێدا تا کوڕەکەی دەگاتە تەمەنی پێویست، کاروبارەکان بەرێوە ببات. کاتێك محەممەد کوڕی ئەغلەب مرد، خەڵکانی قیروان هاتنە لای ئیبراهیم و سەرپەرەستی کاروبارەکانی خۆیان لەو داوا کرد چوونکە بەکەسێکی چاکەکاریان دەزانی. ئەو لەسەرەتا رازی نەبوو بەلاَم دواتر وەلاَمی دانەوە. ئیبراهیم ڕۆشتە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی و کاروبارەکانی گرتەدەست و بەشێوازێکی پەسەند جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست. ئەو دادپەروەر و دووربەندێش بوو. ئارامی بۆ ئەو دەڤەرەکە گێڕایەوە و خراپەکارانی لەناوبرد و گوێی لەداوای خەڵکان گرت. دادپەروەری لەناو ئەواندا ئەنجام دەدا.

کاروانییەکان و بازرگانەکان بەئاسوودەیی رێگەکانیان دەبڕی. ئەو لای دەریای مەدیتەرانە( دەریای سپی ناوەڕاست) قەلاَ و پێگەکانی دروست کرد و لەبەندەری سەبتە، شەوانە ئاگری بۆ رێنیشاندانی دەریاپێوەکان هەڵدەگیرساند. لەکاتی پێشهاتی رووداوێك لەیەك شەودا هەواڵەکان دەگەیشتە ئەسکەندەرییە. دیواری بۆ سووسە دروست کرد و دواتر حەجی ئەنجامدا و هەموو ستەمەکانی قەرەبوو کردەوە و خۆپارێزی کردە پیشە. ویستی لەرێگەی میسرەوە بەرەو مەککە بڕوات بلاَم ئەحمەد کوڕی تولون رێگەی لێگرت. بینی ئەگەر پێداگری بکات لەنێوان موسوڵمانان شەڕ دێتە ئاراوە و خوێنی بێ گوناحەکان دەڕژێت. بەناچار رێگەی دەریای گرتەبەر و ویستی لەدورگەی سیسیلەوە بڕوات بۆ ئەوەی حەج و جیهاد

تێکەڵ بەیەك بکات و دەست بەسەر ئەو قەڵایانەدا بگرێت کەهێشتا دەستیان بەسەردا نەگیراوە. ئەو هەموو سامان و کەرەستەکانی جەنگی ناو هەنبارەکانی هێنایەدەر و رووی کردە سوسە و بەعابایەك لەپێست کەپینەکراو بوو و هاوشێوەی جل و بەرگی خۆپارێزەکان دەهاتە بەرچاو، لەسەرەتای ساڵی ٩٠١/٢٨٩ زاییینی ڕۆشتە ناو شارەکە و لەگەڵ کەشتییە جەنگییەکان ڕێگەی سیسیلی گرتەبەر. گەیشتە شاری یەرتینوا و لەکۆتایی مانگی رەجەب/ دەی مەی دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. لەوێش دادپەروەری بلاْو کردەوە و دواتر رووی کردە تەبەرمین. دانیشتوانی ئەم شارە خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد. کاتێك ئیبراهیم گەیشتە شارەکە، خەڵکان هاتنەدەر و خۆیان پیٚ گەیاند. قورئان خوێن، ئەم ئایەی خوێند: (ئێمە سەرکەوتنمان پیٚ بەخشی، سەرکەوتنێکی درەخشان )[٨]. ئیبراهیم وتی: ئەم ئایە بخوێنە: ( ئەم دوو دەستەیە دوژمنی یەکترن کەسەبارەت بەپەروەردگاری خۆیان شەڕی یەك دەکەن) [٩]. قورئان خوێن ئەم ئایەی خوێند. دواتر ئیبراهیم وتی: خواوەندا! من لەم رۆژەدا شەڕ لەگەڵ ناباوەڕان بەتۆ دەکەم. لەگەڵ دەستەیەك لەشاسوارەکان هێرشی برد و ناباوەڕانی سەرکوت کرد. موسوڵمانان تا ئەو جێگەی دەیانویست، خەڵکیان کوشت و شارەکەیان وێران کرد. دەستەیەك لەرۆمییەکانی شارەکە هەلاْتن. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و رووبەرووی یەکبوونەوە و بەزۆر شکستیان پیٚ هێنان و سامانەکانیان تالاْن و منالەکانیان ئەسیر کرد. ئەم پێشهاتە لەبیست و سێی شەعبان/ پێنجی ژوئەن روویدا. ئیبراهیم فەرمانیدا پیاوەکان بکوژن و ئەسیر و تالاْنییەکان بفرۆشن.

کاتێك هەواڵی گرتنی تەبەرمین بەپاشای رۆم گەیشت، بەگران و گەورەی زانی و حەوت رۆژ تاجی نەخستە سەر و وتی: کەسی خەمبار تاج ناکاتەسەر. رۆم کەوتە جموجۆڵ و هەموان مەبەستی سیسیلیان کرد تا رێگە نەدەن موسوڵمانان دەستی بەسەردا بگرن. ئاگادار بوونەوە کەئیبراهیم رێگەی قوستەنتەنییەی گرتۆتەبەر. پاشای رۆم سوپایەکی گەورەی لەم شارە جێگیر کرد و لەگەڵ سوپایەکی گەورە

---

[٨]: انا فتحنا لك فتحاً مبيناً (فتح/ ١ )

[٩]: هذان خصمان اختصموا في ربهم (حج/ ١٩)

بەرەو سیسیل بەرێکەوت.

ئیبراهیم کەبەسەر تەبەرمین زاڵببوو، چەندین دەستەی بۆ شارەکانی سیسیل نارد – کە لەدەست رۆمییەکاندا بوو– و دەستەیەکی بەرەو میقش و دەستەیەکی بەرەو دەمنش ڕەوانە کرد. کاتێك ئەم دەستانە گەیشتنە شوێنی مەبەست، بینیان خەڵکی ناوچەکە شوێنەکەیان چۆڵ کردووە. لەبەر ئەمە سامانەکایان تالآن کرد. ئیبراهیم دەستەیەکی بۆ رەمتە و دەستەیەکی بۆ یاج نارد و هەموو دانیشتوانی ئەو دوو ناوچە بەدانی باج رازی بوون بەلآم ئیبراهیم رازی نەبوو و لەگرتنی قەلآکان پێداگری کرد. ئەوان قەلآکانیان تەسلیم کرد. ئیبراهیم قەلآکانی وێران کرد و دواتر بەرەو کەسنتە بەرێکەوت. دانیشتوانی ئەم شارە پەیکیان نارد و داوای ئەمانیان کرد بەلآم ئیبراهیم پێی نەبەخشین.

لەم کاتەدا نەخۆشی ئەو دەستی پێکرد. گرفتاری ژانە سك بوو. سوپاکەی لەدەرەوەی شار ئوردووی لێدا و چوونکە فەرماندەکەیان لەناو ئەواندا نەبوو، بەشێوەی پێویست هەوڵ و کۆششیان لەخۆیان نیشان نەدا. ئیبراهیم بەهۆی ئازارەکەیەوە، لەشوێنێکی دیکە دابەزیبوو. توشی نزگەرە هات و خەوی لێ سەندەوە تا ئەوەی شەوی شەممە نۆزدەی زیقەعدەی ساڵی ٢٨٩/ سێ شەممەی بیست و شەشی ئۆکتۆبەری ٩٠١ زایینی کۆچی دوایی کرد.

سەرانی سوپاکەی بڕیاریاندا فەرماندەیی خۆیان بەباوکی عەباس عەبدوللە بسپێرن تا پارێزگاری لەسوپا و گەنجینەکان بکات تا ئەو دەمەی کوڕەکەی لەئەفریقییەوە دێت. پەیکەری بێ گیانی ئیبراهیمیان خستە ناو تابوت و ڕەوانەی ئەفریقییەیان کرد و لەقیروان بەخاکیان سپارد.

ئیبراهیم بیست و پێنج ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەو پیاوێکی بیرمەند، چاکەکار و خوازیاری چاکە بوو. هەموو سامانەکەی کردە خێر و خێرات. بۆ ئاشکرا کردنی نهێنییەکان خاوەنی هێزێکی سەرنجراکێش بوو. یەکێك لەبیرتیژییەکانی ئەمە بوو: یەکێك لەبازرگانەکانی خەڵکی قیروان، هاوسەرێکی جوان، داوێن پاك و چاکەکاری بوو. وەزیری ئیبراهیم لەجوانی ژنەکە ئاگادار بوویەوە و کەسی بەدوادا نارد تا ماوەیەك لەگەڵ ئەو ڕابوێرێت بەلآم ژنەکە رازی

نەبوو. وەزیر زیاتر شەیدای بوو، ئەم بەسەرهاتەی خۆی بۆ پیرێژنێك باس كرد كەهاموشۆی (هاتوچۆ) دەكرد. ئەم پیرێژنە لای ئەمیر و دایكی پێگەیەكی بەرزی پێبڕابوو و ئەویان بەكەسێكی چاكەكار دەزانی و داوای دۆعا و نیزایان لێدەكرد. پیرێژن بەوەزیرەكەی وت: لەگەڵ ئەو ژنە دەدوێم و دەیهێنمە لای تۆ.

پیرێژن ڕۆشتە ماڵی ژنەكە و وتی: جلەكانم پیس بووە و دەمەوێت بیشۆم. ژن ڕۆشتە ژوور و بەخێرهاتنی پیرێژنی كرد. ئەوی بردە ژوور و جلەكانی بۆ شۆرد. پیرێژن هەستا و نوێژی خوێند. ژن خواردنی بۆ هێنا بەلاَم پیرێژن وتی بەڕۆژووە بەلاَم هاموشۆی دەكات. ماوەیەك هاموشۆی كرد تا ئەوەی ڕۆژێك پێی وت: كچێكی بێ دایك و باوكم پەروەردە كردووە و هەنووكە دەخوازم بەشووی بدەم، ئەگەر دەتوانی زێر و خشڵەكانی خۆت بەقەرز بەمن بدە تا كچەكە بڕازێنمەوە. ژن هەموو خشڵەكانی خۆی هێنا و تەسلیم بەپیرێژنەكەی كرد. پیرێژن هەڵیگرت وگەڕایەوە و چەند ڕۆژێك نەبینرا تا ئەوەی ڕۆژێك ڕۆشتە لای ژنە جوانەكە. ژن داوای خشڵەكانی كردەوە. پیرێژن وتی: كاتێك لای تۆ ڕۆشتم، وەزیر منی بینی و هەموو خشڵەكانی لێ سەندم و كاتێك وتم ئەم خشڵانە هی تۆیە، وتی: تەنیا خشڵەكان تەسلیم بەخۆی دەكەمەوە. ژنەكە لەگەڵ پیرێژنەكە كەوتە دەمەبۆڵە و پیرێژن ماڵەكەی بەجێهێشت. ژن، كاتێك هاوسەرەكەی گەڕایەوە، ڕووداوەكەی بۆ باس كرد. بازرگان ڕۆشتە بارەگای ئیبراهیم و ئاگاداری كردەوە. ڕۆژێك ئیبراهیم ڕۆشتە لای دایكی و پرسیاری پیرێژنەكەی كرد. دایكی وتی: هەنووكە لێرەیە و دۆعا بۆ تۆ دەكات. ئیبراهیم بانگی كرد. دایكی ئەوی هێنا. كاتێك ئیبراهیم پیرێژنی بینی، بەگەورەی زانی و ڕێزی لێگرت و ڕووی خۆشی نیشاندا. بەهەمان شێوە كەسەرقاڵی قسە كردن بوون، ئەنگوستیلەی پیرێژنەكەی دەرهێنا و لەدەستی خۆیدا گەمەی پێدەكرد. دواتر ئیبراهیم كۆیلەیەكی خەساوی بانگ كرد و پێی وت: دەڕۆیتە ماڵی پیرێژن و داوا لەكچەكەی دەكەیت، سەوەتەی زێر و خشڵەكانت پێ بدات، نیشانەكانی سەوەتەكەی پێ دەدەیت و ئەم ئەنگوستیلە وەك بەڵگەیەك لەگەڵ خۆت دەبەیت و نیشانی دەدەیت.

كۆیلەی خەساو ڕۆشت و سەوەتەكەی هێنا. ئیبراهیم بەپیرێژنەكەی وت: ئەمە

چییە؟ کاتێك چاوی پیرێژن بەسەوەتەکە کەوت، کەوتە لەرزین. ئیبراهیم ئەوی کوشت و لەناو کۆشکەکەی بەخاکی سپارد. خشڵەکانی بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە و پێی زیاد کرد. بەخۆی وت: ئەگەر ئێستا تۆڵە لەوەزیر بکەمەوە، راستییەکان ئاشکرا دەبێت، چاوەڕێ دەبم و ئەو بەسزای گوناحێکی دیکە، گرفتار دەکەم. دواتر بەتاوانێکی دیکە ئەویشی کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا موعتەمید (خەلیفە)، محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی مورئەلتائی موسڵی وەك جێگری خۆی لەئازەربایەجان دەستنیشان کرد. ئەو دەستەیەکی فراوان لەخەواریج و کەسانی دیکەی کۆکردەوە و بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوت. لەو کاتەدا عەلا کوڕی ئەحمەدی ئەزدی فەرمانڕەوای خوراسان بوو (ئیفلیج ببوو) ئەو لەسەر تەختێك هاتەدەر تا رێگە لەهاتنی محەممەد کوڕی عومەر بگرێت. محەممەد جەنگی و سوپاکەی عەلا شکستی خوارد و خۆی گرفتار بوو. محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی دەستی بەسەر قەڵاکەی عەلا گرت و سێ هەزار هەزار درهەمی دەست کەوت. عەلای لەبەرچاوی ئەو مرد.

لەم ساڵەدا موعتەمید، خزر کوڕی ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی خەتابی تەغلەبی موسڵی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەید بۆ تەبەرستان گەڕایەوە و شاری چالوسی سوتاند چوونکە خەڵکی شارەکە خوازیاری پەیوەست بوون بەیەعقوبی سەفار بوون. زەوییەکانی ئەو ناوچەی بەدەیلەمییەکان سپارد.

هەروەها لەم ساڵدا موعتەمید فەرمانیدا حاجییەکانی خوراسان، ڕەی، تەبەرستان و جورجان کۆبکەنەوە وئاگاداریان بکەنەوە کەیەعقوبی وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاری نەکردووە و ڕۆشتنی ئەو بۆ خوراسان و گرتنی محەممەد کوڕی تاهیر بەفەرمانی ئەو نەبووە.

لەم ساڵەدا موساوری شاری (خەواریج) بەدەستی یەحیا کوڕی جەعفەر فەرمانڕەوای خوراسان، کوژرا. مەسروری بەڵخی و دواتر باوکی ئەحمەد یا هەمان

موەفەق کوڕی متوەکیل، شوێنپێی موساوریان هەڵگرت بەڵام موساور لەدەست ئەوان هەڵات. ( دواتر بەدەستی یەحیا کوڕی جەعفەر کوژرا)

لەم ساڵەدا کوڕی مەروان جولەیقی لەکوردوبا هەڵات و مەبەستی قەڵای حەنشی کرد و دەستی بەسەردا گرت. محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و بۆ ماوەی سێ مانگ گەمارۆی خستەسەر. بارودۆخ بۆ کوڕی مەروان بەرادەیەك دژوار بوو کەگۆشتی چوارپێکانیان دەخوارد. دواتر داوای ئەمانی لەمحەممەد کرد و پێی بەخشرا و ڕێگەی بەتلیوسی گرتەبەر.

هەروەها لەم ساڵەدا خەڵکانی تاکورنا دژی ئەسەد کوڕی حارس شۆڕشیان کرد. سوپاکەی محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئەوان ملکەچی خۆیان نیشاندا.

لەم ساڵەدا باوکی هاشم داود کوڕی سلێمانی جەعفەری و حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی باوکی شەوارب، قازی قازییەکان، مردن. مەرگی باوکی شەوارب لەمانگی ڕەمەزان/ ژوئەن ڕوویدا. باوکی حسەین موسلیم کوڕی حەجاجی نەیشابور، نوسەری کتێبی صحیح (لەحەدیس) و عەبدولعەزیز کوڕی حەییانی موسڵی کەحەدیسی زۆری گێڕاوەتەوە، نەزر کوڕی حەسەنی فەقیهی حەنەفی موسڵی، لەم ساڵەدا کۆچیان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەست و دووی کۆچی ( ٨٧٦ زایینی )

### شەڕی نێوان موەفەق و سەفار

لەموحەرەم/ ئۆکۆتبەری ئەم ساڵە، سەفار لەفارسەوە هێرشی کردە سەر ئەهواز. کاتێك موعتەمید لەهێرشەکەی ئەو ئاگادار بوویەوە، ئیسماعیل کوڕی ئیسحاق و بوفراج (بوغراج)ی بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد وهەموو هاوەڵە زیندانییەکانی یەعقوبی لەزیندانەکان هێنایەدەر. موعتەمید کاتێك ئەوانی خستە گرتووخانە کەیەعقوب محەممەد کوڕی تاهیری ئەسیر کرد. ئیسماعیل بەپەیام لەلایەن یەعقوبەوە گەڕایەوە. باوکی ئەحمەد لەبەغداد بوو. ئەو بەپێی هەواڵە گەشتووەکان لەیەعقوب، هێرش کردنە سەر زەنگییەکانی دواخست. ئەو بازرگانەکانی کۆکردەوە و ئاگاداری کردنەوە کەیەعقوبی وەك فەرمانڕەوای خوراسان، گورگان، تەبەرستان، رەی و فارس و ئاسایشی بەغداد دیاری کردووە. لەم دانیشتنەدا درهەم هاوڕێی یەعقوب ئامادە بوو. یەعقوب لەبەر ئەمە ئەوی ناردبوو تا فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینانەی بۆ وەربگرێت. باوکی ئەحمەد ئەوی لەگەڵ عومەر کوڕی سیما بۆ لای یەعقوب گەڕاندەوە تا فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینانەی پێ بدەن.

نوێنەران لەلای یەعقوب گەڕانەوە و وتیان: لەوەی پێی بەخشراوە، شادمان نییە و دەبێت بگاتە بارەگای موعتەمید. ئەو لەعەسکەری موکەرەمەوە بەرێکەوت و باوکی ساج مەبەستی ئەوی کرد. یەعقوب ڕێزی گرت و چەندین خەڵاتی پێ بەخشی.

کاتێك موعتەمید پەیامەکەی یەعقوبی بیست لەگەڵ سوپاکەی لەسامەرا هاتەدەر و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر. لەوێوە بەرەو زەعفەرانییە بەرێکەوت و لەو شارە ئوردووی لێدا. موەفەقی برای وەك پێشەنگ ڕەوانە کرد. یەعقوب لەعەسکەرە موکەڕەمەوە بەرەو واست بەرێکەوت و لەبیست و چوار جومادی الاوەل، بیست و پێنجی فەوریە پۆشتە ئەو دیارە. موعتەمید لەزەعفەرانییەوە بەرەو سیبی

منالەکانی کوما ڕۆشت. لەوێ مەسروری بەڵخی پەیوەستی بوو. یەعقوب لەواستەوە بەرەو دێری عاقول بەرێکەوت. موعتەمید، موەفەقی برای بۆ جەنگی یەعقوب ڕەوانە کرد. موەفەق، موسا کوڕی بوغای وەك فەرماندەی باڵی ڕاست و مەسروری بەڵخی وەك فەرماندەی باڵی چەپ و خۆی فەرماندەیی دڵی سوپاکەی گرتەدەست.

دوو سوپا ڕووبەرووی یەکبوونەوە و باڵی چەپی یەعقوب هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی موەفەق و شکستی پێهێنا. دەستەیەك لەسەربازەکان و ژمارەیەك لەسەرکردەکان وەك ئیبراهیم کوڕی سیما وکەسانی دیکە کوژران. تێکشکاوەکان پاشەکشێیان کرد.

باوکی ئەحمەد موەفەق، سەری خۆی رووت کرد و وتی: منم گەنجی هاشمی، هێرشی کرد و سوپاکەی لەگەڵ ئەو هێرشی کردە سەر سوپاکەی یەعقوب. سوپاکەی یەعقوب خۆڕاگری کرد و شەڕێکی بوێرانەیان لەخۆیان نیشاندا. ژمارەیەك لەهاوەڵانی یەعقوب وەك حەسەنی درهەمی کوژران. سێ تیر بەردەست و قوڕگی یەعقوب کەوت. جەنگ تا نیمەڕۆ درێژەی کێشا. دواتر دیرانی و محەممەد کوڕی ئەوس فریای باوکی ئەحمەد کەوتن و هەموو سەربازەکانی ئوردووگاکەی کۆبوونەوە. هاوەڵانی یەعقوب جەنگ لەگەڵ موەفەقیان پەسەند نەدەکرد چوونکە خەلیفەیان لەبەرچاوی خۆیان دەبینی. سوپاکەی موەفەق هێرشی کردە سەر یەعقوب و سوپاکەی. هاوەڵانی یەعقوب شکستیان خوارد و خۆی بەتەنیا مایەوە لەگەڵ هاوەڵە تایبەتەکانی کەئەوانیش گۆڕەپانیان بەجێهێشت. سوپاکەی باوکی ئەحمەد شوێنیان کەوتن و سامانی ناو ئوردووگاکەیان تالأن کرد. زیاتر لەدە هەزار ئەسپ و ئێستر لەناو ئوردووگاکەی یەعقوب دەبینرا. کالأکان و کیسەکانی موشك بەڕادەیەك فراوان بوون، گواستنەوەیان دژوار دەهاتە بەرچاو. محەممەد کوڕی تاهیر کەبەزنجیر بەسترابوویەوە، ئازاد کرا. موەفەق خەلأتی پێبەخشی و دواتر وەك سەرۆکی ئاسایشی بەغداد دەستنیشانی کرد.

یەعقوب دوای ئەم شکستە ڕێگەی خوزستانی گرتەبەر و لەجوندیشاپور ئوردوی لێدا. ساحەبی زەنج نامەی بۆ نووسی و بۆ گەڕانەوە بۆ بەغداد هانیدا و

بەڵێنی هاوکاری پێدا.

یەعقوب فەرمانی بەدەبیرەکەیدا ئەمە بنووسێت: بڵێ ئەی ناباوەڕان بەخوا، ئەوەی ئێوە دەیپەرەستن، من نایپەرەستم.[١٠]

ئەم جەنگە لەیانزەی رەجەب/ یانزەی ئاوریل روویدا. موعتەمید نامەیەکی بۆ کوڕی واسڵ نووسی و وەك فەرمانڕەوای فارس دەستنیشانی کرد. کوڕی واسڵ پێشتر هێرشی کردبووە سەر فارس و بەکۆکردنەوەی دەستەیەکی فراوان دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرتبوو. یەعقوب سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی کوڕی عەزیزی سەری ڕەوانەی فارس کرد و فارسی خستە ژێر فەرمانی خۆی. موعتەمید بۆ سامەڕا گەڕایەوە.

باوکی ئەحمەد موەفەق، بەمەبەستی شوێنکەوتنی سەفار، ڕێگەی واستی گرتەبەر و فەرمانی بەسوپاکەیدا خۆیان بۆ ئەم کارە ئامادە بکەن بەلاّم لەم کاتەدا نەخۆش کەوت و لەگەڵ مەسروری بەلْخی بۆ بەغداد گەڕایەوە. دەستی بەسەر زەوی و کۆشکەکانی باوکی ساج گرت و بەمەسروری بەخشی. محەممەد کوڕی تاهیر ڕۆشتە ناو بەغداد.

## ڕووداوەکانی تایبەت بەساحەبی زەنج

لەم ساڵەدا ساحەبی زەنج سوپاکەی بۆ بەتیحە و دەشتی میشان (میسان) ڕەوانە کرد. لەوێوە لەبەر ئەوەی ئەم کەنارانە بەهۆی گەڕانەوەی مەسروری بەلْخی بۆ جەنگی یەعقوب لەسەربازە حکومەییەکان چۆڵ کرابوو، ساحەبی زەنج دەستە جەنگاوەرەکانی بۆ ئەو لاتر نارد تا تالاّنی بکەن و لەناوی ببەن.

کاتێك ساحەبی زەنج ئاگادار بوویەوە کەبەیتەحە سەربازی تیا نەماوە، فەرمانی بەسلێمان کوڕی جامع و دەستەیەك لەهاوەلاّنیدا بەرەو حەوانیت بڕۆن. سلێمان کوڕی موسای بەرەو قادسیە ڕەوانە کرد.

کوڕی تورکی لەگەڵ سی کەشتی جەنگی بەرەو ئوردووگای زەنگییەکان

[١٠]: قل یا ایها الکافرون لا اعبد ما تعبدون. (کافرون/ ١و٢)

بەرێکەوت و ئەوەی بینی، ڕفاندی و تالآنی کرد. ساحەبی زەنج، نامەیەکی بۆ سلێمان کوڕی موسا نووسی و فەرمانی پێدا ڕێگە لەکوڕی تورکی بگرێت. سلێمان ڕێگەی لەکوڕی تورکی بەست. کوڕی تورکی بۆ ماوەی یەك مانگ بەجەنگەوە سەرقاڵ بوو تا خۆی ڕزگار کرد. لەم کاتەدا دەستەیەك لەکەسە ناودارەکانی بیلالییە (خەواریج) و هاوەڵانیان لەگەڵ سەد ویەنجا بەلەمی جەنگی پەیوەستی سلێمان بوون.

مەسرور پێش هێرش کردنە سەر واست و هاوکاری موعتەمید، دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بەکەشتییە جەنگییەکان بۆ شەڕی ساحەبی جەنگ ڕەوانە کردبوو بەلاّم سلێمان شکستی پێ هێنان و دەستی بەسەر حەوت کەشتی جەنگیدا گرت و ئەسیرەکانی کوشت.

باهلییەکان داوایان لەسلێمان کرد لەعەقەر، ئەولای تەهسا[11] و دارستانەکانی سەنگەر بگرێت. باهلییەکان نەیاندەویست ئەو لەوان دوور بکەوێتەوە چوونکە هاوکاریان کردبوو و لەخەلیفە دەترسان. سلێمان بەرەو تەهسا بەرێکەوت و لەگوندی مەروان خێوەتی هەڵدا. سەرکردەکانی باهلی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و ئەم بارودۆخەی بۆ ساحەبی زەنج نووسی. ساحەبی زەنج کارەکەی پشتراست کردەوە و فەرمانی پێدا خواردەمەنی و چوارپێکەی خۆی بۆ ئەو بنێرێت. سلێمان ئەو کارەی کرد.

سلێمانیان ئاگادار کردەوە کەئەغرتەمیش و حەشیش لەگەڵ کەشتی و بەلەمە جەنگییەکان مەبەستی جەنگی ئەویان هەیە. سلێمان بێ ئۆقرەیی لەخۆی نیشاندا. کاتێك سوپاکەی ئەغرتەمیش دەرکەوت و سلێمان ئەوانی بینی، دەستەیەك لەهاوەڵانی هەڵبژارد و لەپشتەوە هێرشی کردە سەر ئەغرتەمیش. ئەغرتەمیش بوێرانە پێشڕەوی دەکرد. سلێمان فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا خۆیان نیشانی سوپاکەی ئەغرتەمیش نەدەن و تا دەتوانن خۆیان لەچاوی ئەوان بەدوور بگرن تا ئەو کاتەی بانگی کەڕەناکان دەبیستن و هەرکاتێك ئەم دەنگەیان بیست، هێرش دەست پێبکەن.

---

[11]- لەمێژووی تەبەری بەتەمیسا ناوی هاتووە. (وەرگێر)

ئەغرتەمیش هێرشی کردە سەریان. سوپاکەی سلێمان بڵاوبوویەوە و تەنیا دەستەیەك لەوان ڕووبەڕووی سوپاکەی ئەغرتەمیش بوونەوە و ڕێگەیان لەهاتنی ئەوان بۆ ناو ئوردووگاکەیان گرت. لەم کاتەدا سلێمان لەپشتەوە هات و فوویان کرد بەکەرەناکاندا. هاوەڵانی سلێمان خۆیان هەڵدایە ناو ئاوەکە و بەدەم مەلە کردنەوە هێرشیان کردە سەر سوپای دوژمن. ئەغرتەمیش هەڵات و سوپاکەی تەهسا خۆیان نیشاندا و شمشێریان دەرکێشا وحەشیشیان لەناو برد. ئەغرتەمیش شکستی خوارد و زەنگییەکان تا ئوردووگاکەیان شوێنیان کەوتن. زەنگییەکان ئەوەی دەیانویست، بەدەستیان هێنا و دەستیان بەسەر کەشتییە پڕ پارەکاندا گرت. بەڵام ئەغرتەمیشی گرت و سامانە تاڵان کراوەکانی لێ سەندنەوە. سلێمانیش گەڕایەوە و بەسەر ئەواندا زاڵ بوو و تاڵانی زۆری دەستکەوت. ئەم هەواڵەی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و سەری بڕاوی حەشیشی بۆ نارد. ساحەبی زەنج سەری بڕاوی حەشیشی بۆ عەلی کوڕی ئەبان لەکەنارەکانی ئەهواز نارد.

سلێمان دەستەیەك لەسوپاکەی ڕەوانە کرد و ئەوان دەستیان بەسەر یانزە کەشتیدا گرت و مەلەوانەکانیان کوشت.

## جەنگی گەورەی زەنگییەکان و شکستی ئەوان.

لەم ساڵەدا لەنێوان زەنگییەکان و ئەحمەد کوڕی لەیسویە جەنگێکی گەورە ڕوویدا. هۆکارەکەی ئەوە بوو مەسروری بەڵخی، ئەحمەد کوڕی لەیسویەی وەك فەرمانڕەوای ئەهواز ڕەوانە کرد و ئەو لەشوش جێگیر بوو.. یەعقوبی سەفار، محەممەد کوڕی عوبەیدالله کوڕی هەزار مەردی کوردی وەك فەرمانڕەوای ئەهواز دەستنیشان کرد. محەممەد نامەی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و ئەوی بۆ گرتنی ئەم ناوچەیە تەماحکار کرد و وای نیشاندا بەنوێنەرایەتی ئەو فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیە دەکات.

محەممەد پێشتریش نامەی بۆ ساحەبی زەنج دەنووسی بەشێوەیەك هەم لەگەڵ سەفار دەسازا هەم لەگەڵ ساحەبی زەنج تا بەم شێوەیە بتوانێت بارودۆخ بۆ خۆی سەقامگیر بکات. ساحەبی زەنج لەسەر ئەم بنەمایە وەڵامی داواکەی ئەوی دایەوە

کەعەلی کوڕی ئەبان ببێتە هەڵسوڕێنەری کاروباری ئەو دەڤەرە و محەممەد کوڕی عوبەیدالله نوێنەری ئەو لەم جێگانە بێت. محەممەد رازی بوو. عەلی کوڕی ئەبان سوپایەکی گەورەی نارد و محەممەد کوڕی عوبەیدالله پشتیوانی لەسوپاکەی کرد و بیریان لەگرتنی شوش کردەوە. ئەحمەد کوڕی لەیسویە و سەربازەکانی خەلیفە، رێگەیان لێگرتن و رووبەروویان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ئەسیریان کردن.

دواتر ئەحمەد کوڕی لەیسویە ڕۆشت و لەجوندی شاپور ئوردووی لێدا. عەلی کوڕی ئەبان لەئەهوازەوە بەرێکەوت و بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەحمەد کوڕی لەیسویە داوای هاوکاری لەمحەممەد کوڕی عوبەیدالله کرد. محەممەد هاتە شوشتەر و هەواڵی هاوپەیمانیەتی نێوان ئەو دوانە بەئەحمەد کوڕی لەیسویە گەیشت. لەبەر ئەمە لەجوندی شاپورەوە مەبەستی شوشی کرد.

محەممەد بەڵێنی بە عەلی کوڕی ئەباندا بوو لەرۆژی هەینی بۆ ساحەبی زەنج و بەناوی ئەو وتار بخوێنێتەوە بەڵام لەرۆژی هەینی بەناوی موعتەمید و سەفار وتاری خوێندەوە. کاتێك عەلی کوڕی ئەبان لەمە ئاگادار بوویەوە، بۆ ئەهواز گەڕایەوە و پردی ئەو ناوچەی وێران کرد تا هیچ سوپایەك نەتوانێت شوێنپێی هەڵگرێت. دواتر هێرشی کردە سەر عەسکەر موکەرەم و تالانی کرد. ئەم شارە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ساحەبی زەنج بەستبوو بەڵام عەلی و سوپاکەی پەیمانیان شکاند و لەوێوە رێگەی ئەهوازیان گرتەبەر.

کاتێك ئەحمەد کوڕی لەیسویە ئاگادار بوویەوە، رووی کردە شوشتەر و لەگەڵ محەممەد کوڕی عوبەیدالله و سوپاکەی جەنگا. محەممەد شکستی خوارد و ئەحمەد ڕۆشتە شوشتەر. عەلی کوڕی ئەبانیان ئاگادار کردەوە کەئەحمەد مەبەستی جەنگی تۆی لەسەردایە، عەلی بەمەبەستی جەنگ بەرێکەوت و هەردوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لەیەك کوشت. دەستەیەك لەعەرەبە بیابان نشینەکانی سوپاکەی عەلی داوای ئەمانیان لەئەحمەد کرد و دەستەیەکی دیکە لەسەربازەکانی هەڵاتن و تەنیا ژمارەیەکی کەمی لەگەڵدا مایەوە و خۆڕاگرییان کرد. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و عەلی کوڕی ئەبان پیادە

دەجەنگی. دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەحمەد ناسیانەوە و ئەویان بەخەڵکان ناساند. کاتێك ناسرایەوە، هەڵات و خۆی گەیاندە ئاوی مەسرقان. دەستەیەك لەهاوەڵانی بەبەلەمی جەنگی گەیشتن. ئەو بەبریندارى سەرکەوت و خۆی رزگار کرد. ژمارەیەك لەشاسوارەکانی کوژران.

## بەسەرهاتی ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلەی خوجوستانی

ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلەی خوجوستانی لەخوجستان بوو کە لەکێوەکانی هەرات و دەوروبەری بادغەیس لەقەڵەم دەدرێت. ئەو لەهاوەڵانی محەممەد کوڕی تاهیر بوو. کاتێك یەعقوب کوڕی لەیس دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت، ئەحمەدی کردە شوێنکەوتەی خۆی و براکەی عەلی کوڕی لەیس. مناڵەکانی شورکەب سییان بوون: ئیبراهیم، باوکی حەفس یەعمەر و باوکی تەڵحە مەنسور مناڵەکانی موسلیم. پیرترینی ئەوان ئیبراهیم بوو. ئەو لەجەنگی یەعقوب لەگەڵ حەسەن کوڕی زەید لەگورگان ئەزمونێکی جوانی لەخۆی نیشاندا. یەعقوب پێگەی لەچاو کەسانی دیکە بەرز کردەوە. رۆژێك ئیبراهیم هاتە نەیشابور. رۆژێکی سارد بوو. یەعقوب پێستێکی سمورەی کەوەك عابا بەکاری دەبرد، پێی بەخشی. خوجوستانی رژدی بەئیبراهیم برد و پێی وت: یەعقوب دەیەوێت فریوت بدات چوونکە تا ئێستا دیاری لەمشێوەی بەهیچ کام لەکەسە نزیکەکانی خۆی نەداوە مەگەر ئەوەی لەناوی بردبێت. ئیبراهیم لەم وتەیە پەرێشان و بیری لەرێگە چارەیەك کردەوە. خوجوستانی پێی وت: رێگە چارە ئەوەیە هەردووك بۆ لای یەعەمری برات هەڵبێن چوونکە منیش لەو دەترسم. یەعمەر، لەشاری بەڵخ گەمارۆی خستبووە سەر باوکی داودی ناهجوزی. پێنج هەزار جەنگاوەر هاورێیەتیان دەکرد. ئەوان بڕیاریاندا هەمان شەو هەڵبێن. ئیبراهیم کەپێش خوجوستانی هاتبووە شوێنی دیاریکراو، کاژێرێك چاوەڕوان بوو بەڵام ئەوی نەبینی و خۆی رێگەی سەرەخسی گرتەبەر. خوجوستانی هاتە لای یەعقوب و لەهەڵاتنی ئیبراهیم ئاگاداری کردەوە. کەسانێکیان بەدوای ئەودا نارد و لەسەرەخس گرتیان و خوێنیان ڕشت. بەم شێوەیە یەعقوب لەخوجوستانی نزیك بوویەوە.

کاتێك یەعقوب مەبەستی گەڕانەوە لەسەجستانی کرد، عەزیز کوڕی سەری وەك فەرمانڕەوای نەیشابور و عەمرۆ کوڕی لەیسی وەك فەرمانڕەوای هەرات دەستنیشان کرد. عەمرۆ، تاهیر کوڕی حەفسی باغەیسی وەك جێگری خۆی لەهەرات دانا. یەعقوب لەسالّی ٨٧٥/٢٦١ زایینی ڕێگەی سەجستانی گرتەبەر.

خوجوستانی لەسەر بنەمای ئەوەی ئەندێشەی لێ دەکرد حەزی دەکرد درەنگتر لەکەسانی دیکە بڕوات، لەبەر ئەمە بەعەلی کوڕی لەیسی وت: دوو براکەی تۆ خوراسانیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد و هیچ بەرتۆ نەکەوت، باشتر وایە من ڕەوانەی خوراسان بکەیت تا شتێك بۆ تۆ بەدەست بێنم و کاروبارەکانی تۆ سامان بدەم. عەلی داوای مۆڵەتی لەیەعقوب کرد تا ئەحمەد بۆ خوراسان ڕەوانە بکات و یەعقوب مۆڵەتی پێدا. کاتێك ئەحمەد بۆ ماڵئاوایی هاتە لای یەعقوب، یەعقوب بەشێوەیەکی باش هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد و دواتر ڕەوانەی کرد و خەلاّتی پێ بەخشی. کاتێك ئەحمەد لای یەعقوب ڕۆشت، یەعقوب وتی: شایەتی دەدەم پشتی ئەو هاوشێوەی پەیمان شکێنەکانە و ئەمە دواین ڕۆژی فەرمانبەری ئەو لەئێمەیە. کاتێك ئەحمەد لەکەسانی دیکە جیابوویەوە سەد پیاوی بۆ خۆی هەڵبژارد و ئەوانی بردە پشتی نەیشابور و لەگەڵ فەرمانڕەواکەی جەنگی و دەری پەڕاند و باجی وەرگرت. دواتر ڕێگەی قومسی گرتەبەر و لەبەستام کوشتارێکی گەورەی بەرێخست و لەسالّی ٨٧٥/٢٦١ زایینی دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. دواتر ڕووی کردە نەیشابور کەعەزیز کوڕی سەری فەرمانڕەوایەتی دەکرد. عەزیز هەلاّت و ئەحمەد باروبنەی ئەوی تالاّن کرد و دەسەلاّتی بەسەر نەیشابوردا بلاّو کردەوە و پێشنیاری پەیوەست بوون بەتاهیریەکانی کرد. ئەم پێشهاتە لەسەرەتای ٨٧٦/٢٦٢ زایینی ڕوویدا. دواتر نامەیەکی بۆ ڕافیع کوڕی هەرسیمە نووسی و بانگی کرد. هەرسیمە هات و ئەحمەد ئەوی وەك فەرماندەی سوپاکەی دەستنیشان کرد. دواتر نامەیەکی بۆ یەعمەر کوڕی شورکەب نووسی کەگەمارۆی خستبووە سەر بەلّخ و ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کرد تا بەهاوکاری یەك دەست بەسەر ولاّتدا بگرن. بەلاّم یەعمەر بەهۆی هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئیبراهیمی برای ئەوی بەکەسێکی بڕواپێکراو نەزانی. یەعمەر ڕێگەی هەراتی گرتەبەر و لەگەڵ تاهیر

کوڕی حەفس جەنگی و کوشتی و دەسەڵاتی بەسەر سنوری فەرمانڕەوایەتی تاهیر بڵاو کردەوە. ئەحمەد رووبەرووی بوویەوە و لەنێوان ئەم دوانە چەندین شەڕ و دەرگیری روویدا.

باوکی تەڵحە کوڕی شورکەب یەکێك لەجوانترین گەنجەکان و عەبدوللە کوڕی بیلال شەیدای ئەو بوو. باوکی تەڵحە بەیەکێك لەسەردارەکانی یەعمەر دەژمێردرا. عەبدوللە نامەیەکی بۆ خوجوستانی نووسی و ئاگاداری کردەوە کەدەیەوێت بەزمێك ئامادە بکات و یەعمەر و هاوەڵانی بانگێشتی ئەم بەزمە بکات. بۆ ئەم بەزمە رۆژێکی دیاریکرد. فەرمانی بەخوجوستانیدا لەو رۆژەدا هەموویان بگرێت و خۆی لەم کارەدا هاوکاری دەکات. تەسلیم کردنی باوکی تەڵحە بەعەبدواللە تەنیا مەرجی ئەو بوو. ئەحمەد رازی بوو. عەبدوللە کوڕی بیلال خواردنی ئامادە کرد و یەعمەر و هاوەڵانی بانگێشت کرد. ئەحمەد هێرشی کردە سەریان و یەعمەری دەستگیر کرد و ڕەوانەی لای نوێنەرەکەی خۆی لەنەیشابوری کرد. ئەو یەعمەری کوشت. دەستەیەك لەهاوەڵانی یەعمەر لەدەوری باوکی تەڵحەی برای کۆبوونەوە و کوڕی بیلالیان کوشت و رێگەی نەیشابوریان گرتەبەر. نەیشابور لەژێر فەرمانی حسەین کوڕی تاهیر برای محەممەد کوڕی تاهیردا بوو. ئەو لەئیسفەهانەوە هاتبوو. حسەین تەماحی ئەوەی لەدڵدابوو خوجوستانی بەناوی ئەو وتار بخوێنێتەوە، هەرچەند ئەحمەد وای نیشان دەدا بەڵام ئەو کارەی نەکرد. کاتێك باوکی تەڵحە گەیشت، وتاری بەناوی حسەین کوڕی تاهیر خوێندەوە و لای ئەو مایەوە. خوجوستانی لەگەڵ دوانزە هەزار سەرباز بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و لەسێ مەنزڵی نەیشابور، ئوردووی لێدا و عەباسی برای بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان نارد. باوکی تەڵحە رووبەرووی بوویەوە و جەنگ لەنێوان دوو سوپا دەستی پێکرد. عەباس کوژراوە و هاوەڵانی بڵاوەیان لێکرد.

کاتێك هەواڵی ئەوان بەئەحمەد گەیشت، بۆ هەرات گەڕایەوە بەڵام لەکوژرانی براکەی بێ ئاگا بوو و بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو بزانێت، پارەیەکی زۆری خەرج کرد بەڵام کەس نەیتوانی ئەو بدۆزێتەوە. رافیع کوڕی هەرسیمە ملکەچی فەرمانەکانی باوکی تەڵحە و داوای ئەمانی لێکرد. باوکی تەڵحە ئەمانی پێبەخشی و ئەوی

لەخۆی نزیك كردەوە و بەكەسێكی بڕواپێكراوی زانی. رافیع بۆ دۆزینەوەی عەباس لێكۆڵینەوەی كرد و ئەحمەدی لەهەواڵی مەرگی ئەو ئاگادار كردەوە.

باوكی تەڵحە، رافیعی بۆ بوست و بەیهەق نارد تا خۆی باجی ئەو سنورانە وەربگرێت. دوو سەركردەی كردە هاوڕێی ئەو. رافیع باجی كۆكردەوە و دوو سەركردەكەی گرت و بۆ پەیوەست بوون لەخوجوستانی رووی كردە یەكێك لەگوندەكانی خواف و ئوردووی لێدا. عەلی كوڕی یەحیای خارجی لەوێ بوو. رافیع لای ئەو مایەوە.

هەواڵی پەیمان شكێنی رافیع بەباوكی تەڵحە گەیشت، شوێنپێی هەڵگرت و شەوانە خۆی پێگەیاندن و لەگەڵ حەلی و هاوەڵانی رووبەروو بوویەوە. ئەو حەلی بەرافیع دەزانی. رافیع بێ هیچ زیانێك هەڵات و لەجەنگ لەگەڵ ئەو خۆی بەدوور گرت و ئەو رێزی لەخۆی و هاوەڵانی گرت.

دواتر باوكی تەڵحە، سوپایەكی بۆ گورگان ڕەوانە كرد. سابت كوڕی حەسەن كوڕی زەید فەرمانڕەوایەتی گورگانی دەكرد و دەیلەمییەكان لەگەڵ ئەودا بوون. ئیسحاقی شاری (خارجی) فەرماندەی سوپاكەی باوكی تەڵحە بوو. ئەوان لەگورگان لەگەڵ دەیلەمییەكان جەنگان و ژمارەیەكی زۆریان لێ كوشتن و ئەوانیان لەو شارە دەرپەڕاند. ئەم جەنگە لەرەجەب/ مارسی ٨٧٦ زایینی روویدا.

دواتر ئیسحاقی شاری دژی باوكی تەڵحە شۆڕشی كرد و باوكی تەڵحە بۆ جەنگی ئەو بەرێكەوت بەڵام لەرێگە بەڕاو و رابواردن سەرقاڵ بوو. ئیسحاق هێرشی كردەسەر و ژمارەیەكی زۆر لەسوپاكەی كوشت و باوكی تەڵحە بەرەو نەیشابور هەڵات. خەڵكانی نەیشابور ئەویان بەریسوا لەقەڵەمدا و لەشارەكەیان دەریان كرد. باوكی تەڵحە فەرسەخێك لەشارەكە دوور كەوتەوە و لەوێ دەستەیەكی كۆكردەوە و لەگەڵ خەڵكانی نەیشابور جەنگی. دواتر نامەیەكی درۆینەی لەزمانی خەڵكانی نەیشابورەوە بۆ ئیسحاق نووسی تا بەرەو لای ئەوان بێت. ئیسحاق فریوی ئەم نامەی خوارد. باوكی تەڵحە نامەیەكی درۆینی لەزمانی ئیسحاقەوە بۆ خەڵكانی نەیشابور نووسی و بەڵێنی پێدان دژی باوكی تەڵحە هاوكاریان بكات. فەرمانی پێدان پاسەوانی رێگەكان بكەن و تا گەیشتنی ئەو رێگە

نەدەن باوکی تەڵحە لەشارەکە نزیك ببێتەوە. خەڵکانی نەیشابوریش فریوی ئەم نامەیان خوارد و بەنامەی ئیسحاقیان زانی و فەرمانەکانیان ئەنجامدا.

ئیسحاق رێگەی نەیشابوری گرتەبەر و کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە، باوکی تەڵحە خۆی هێرشی کردەسەر و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ئەوی گرت. باوکی تەڵحە بریندای کرد و ئەوی خستە ناو چاڵێك کەچیتر نیشانی لیٛ نەبینرا. هاوەڵانی ئیسحاق هەلاتن و دەستەیەك لەوان پەنایان بۆ نەیشابور برد. باوکی تەڵحە بارودۆخی لەنەیشابورییەکان دژوار کرد. نەیشابورییەکان نامەیەکیان بۆ خوجوستانی لەهەرات نووسی و داوای هاوکارییان لێکرد. خوجوستانی لەماوەی دوو شەو و رۆژ خۆی بەوان گەیاند و شەوانە ڕۆشتە ناو شارەکە. دەروازەکانی شارەکەیان بۆ کردەوە و ئەو ڕۆشتە ناو شارەکە. باوکی تەڵحە لەگەمارۆی سەر نەیشابور دەستی هەڵگرت، ڕۆشتە لای حەسەن کوڕی زەید و داوای هاوکاری لێکرد. حەسەن بەسوپایەك هاوکاری کرد و بەم شێوەیە باوکی تەڵحە بۆ نەیشابور گەڕایەوە بەلاٛم هیچی دەست نەکەوت. لەوێوە رێگەی بەڵخی گرتەبەر و گەمارۆی خستە سەر باوکی داودی ناهجوزی و خەڵکانێکی زۆر پەیوەستی بوون. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٢٦٦/ ٨٧٩ زایینی روویدا.

خوجوستانی بۆ جەنگی حەسەن کوڕی زەید بەرێکەوت چوونکە ئەو هاوکاری باوکی تەڵحەی کردبوو. حەسەن داوای هاوکاری لەخەڵکانی گورگان کرد و خەڵکانی گورگان هاوکارییان کرد. رووبەرووی خوجوستانی بوویەوە بەلاٛم سوپاکەی تێکشکا و سامانەکەیان تالاٛن کرا. خوجوستانی چوارهەزار درهەم باجی لیٛ وەرگرتن. ئەم پێشهاتە لەرەمەزانی ٢٦٥/ ئاوریلی ٧٨٩ زایینی روویدا.

لەم ساڵەدا ٨٧٩/٢٦٥ زایینی یەعقوب کوڕی لەیس مرد و عەمرۆی برای جێگەی گرتەوە. عەمرۆ گەڕایەوە بۆ سەجستان و مەبەستی هەراتی کرد. خوجوستانی لەهەرات بۆ نەیشابور گەڕایەوە. عەمرۆ کوڕی لەیس رووبەرووی بوویەوە و دوو سوپا ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند. عەمرۆ هەلاٛت و بۆ هەرات گەڕایەوە و ئەحمەد (خوجوستانی) لەنەیشابور مایەوە.

کەیکان یا هەمان یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی یەحیای زوهەلی و دەستەیەك

لەخۆبەخشەکان و فەقیهەکانی نەیشابور خوازیاری پەیوەست بوون بەعەمرۆ کوڕی لەیس بوون چوونکە دانراوی خەلیفە بوو. خوجوستانی بیری لەوە کردە ئاژاوەیەك لەناو ئەواندا بنێتەوە تا سەرقاڵی یەکتر بن (و چیتر پشت بەو نەبەستن). ئەو دەستەیەك لەفەقیە و زانا ئایینییەکانی عێراقی هێنایە لای خۆی و چاکەی لەگەڵ کردن. ئەوانی لەخۆی نزیك کردەوە و رێزی لێ گرتن. ئەوان رێگەی ناسازگاری لەگەڵ کەیکانیان گرتەبەر و دوژمنایەتی ئەویان دەستپێکرد.

کەیکان شوێنکەوتەی ئایینی خەڵکانی مەدینە بوو. بەم شێوەیە خوجوستانی لەهەردووکیان ئاسوودە بوو و رێگەی هەراتی گرتەبەر کەنشینگەی عەمرۆ کوڕی لەیس بوو. لەساڵی ٧٨١/٢٦٧ زایینی گەمارۆی خستەسەر بەڵام نەیتوانی هیچ سەرکەوتنێك بەدەست بێنێت. دواتر رێگەی سیستانی گرتەبەر و لەسەر رێگەی خۆی گەمارۆی خستە سەر رەملی سی، لێرەیش ئەنجامێکی دەست نەکەوت. بیری لەفریوێك کردەوە. رێزی لەپیاوێکی حەلاج گرت کەماڵەکەی لەنزیك دیواری شارەکە بوو. خوجوستانی پەیمانی لەگەڵ بەست تا سوپاکەی لەماڵەکەی ئەوەوە، رێگەیەك بۆ ناو شار بکەنەوە. دوو پیاو لەهاوەڵانی خوجوستانی پەنایان بردە بەر شارەکە و فەرمانڕەواکەیان ئاگادار کردەوە. پیاوی حەلاجیان گرت و ماڵەکەیان وێران کرد. ئەوەی خوجوستانی بیری لێ دەکردەوە، بوو بەبڵقی سەر ئاو.

نوێنەری خوجوستانی لەنەیشابور خراپەکاری کردە پیشە و هێزی بەئاژاوەگێڕان و خراپەکاران بەخشی. هەموان لەدەوری کەیکان کۆبوونەوە و دژی نوێنەرەکەی ئەو شۆڕشیان کرد. عەمرۆ کوڕی لەیس بەسوپاکەی هاوکاری کردن و نوێنەری خوجوستانیان گرت. هاوەڵانی عەمرۆ لەنەیشابور مانەوە. ئەحمەدی خوجوستانی لەمە ئاگادار بوویەوە. خۆی گەیاندە نەیشابور. کەیکان و کەسانی دیکە بۆ سەرکوت کردنی ئەو رۆشتنە دەرەوەی شارەکە بەڵام سوپاکەی خوجوستانی پاشەکشێیان پێکردن. دەستەیەك لەهاوەڵانی کەیکان کوژران. کەیکان خۆی شاردەوە و دوای ماوەیەك خۆی ئاشکرا کرد. ئەویان گرت و خستیانە ناو دیوارێك تا گیانی سپارد.

ئەحمەد هەموو ساڵی ٨٧١/٢٦٧ زایینی لەنەیشابور مایەوە.

عەمرۆ نامەی بۆ باوکی تەڵحە نووسی. عەمرۆ، پێشنیاری هاتن بۆ هەراتی پێکرد لەکاتێکدا باوکی تەڵحە دەیویست گەمارۆ بخاتە سەر بەلْخ. ئەو هات و عەمرۆ رێزی لێگرت. سامانێکی زۆری خستە بەردەست و ئەوی لەخوراسان دانا و خۆی بۆ سیستان گەڕایەوە.

ئەحمەد هێرشی کردە سەر سەرخس کەکارگوزارەکەی عەمرۆ لەوێ بوو. باوکی تەڵحە خۆی پێگەیاند و جەنگی دەست پێکرد. باوکی تەڵحە شکستی خوارد و لەهەمان شوێن کەهاتبوو، گەڕایەوە. ئەحمەد شوێنی کەوت و لەخولم پێی گەیشتەوە. دووبارە جەنگ لەنێوان ئەوان دەستی پێکرد. باوکی تەڵحە شکستی خوارد و ئەحمەد لەتەخارستان مایەوە.

ناسەرار عەباسی قەتان ڕۆشتە لای باوکی تەڵحە و لەوێوە هێرشی کردە سەر نەیشابور. دانیشتوانی نەیشابور هاوکاریان کرد و دایکی خوجوستانی و سامانەکەی ئەویان گرت. ناسەرار لەنەیشابور مایەوە و باوکی تەڵحە پەیوەستی بوو بەڵام خەڵکانی نەیشابور لەڕۆشتنی ئەو بۆ ناو شارەکە رێگریان کرد.

ئەحمەدی خوجوستانی ئاگادار بوویەوە. ئەو لەم کاتەدا لەتایکانی تەخارستان بوو و بەخێرایی رێگەی نەیشابوری گرتەبەر.

کاتێك تاهیریەکان لەشوێنکەوتنی خوجوستانی بێ هیوا بوون، ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی تاهیر فەرمانڕەوای خوارەزم، باوکی عەباسی نەوفلی لەگەڵ پێنج هەزار پیاو ڕەوانە کرد تا خوجوستانی لەنەیشابور دەرپەڕێنن. ئەحمەد لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار بوویەوە و چەند نوێنەرێکی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد تا رێگەی خوێنرێژی لێ بگرێت. نەوفلی نوێنەرەکانی گرت و فەرمانیدا ئەشکەنجەیان بکەن و ریشیان بتاشن. کاتێك جەلادەکانی بانگ کرد بۆ ئەوەی سەر لەجەستەیان جیا بکەنەوە و ریش تاشەکانی بانگ کرد بۆ ئەوەی ریشیان بتاشن، هەواڵیان بۆ هات کەسوپاکەی ئەحمەد نزیك بۆتەوە. لەبەر ئەمە نوێنەرەکانیان پشتگوێخست و سەرقاڵی ئەحمەد و سوپاکەی بوون. نوێنەرەکان بۆ لای ئەحمەد هەڵاتن و ئەویان لەبەسەرهاتەکە ئاگادار کردەوە. ئەحمەد سوپاکەی خۆی کۆکردەوەو هاوشێوەی یەك پەیکەر هێرشیان کردە سەر سوپاکەی نەوفلی و

ژمارەیەکی زۆریان کوشت. نەوفلیان گرت و بردیانە لای ئەحمەد. ئەحمەد پێی وت: نوێنەرەکان هاتوچۆی سەرزەمینی ناباوەڕان دەکەن بێ ئەوەی کەس لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکات، بەڵام تۆ شەرمت نەکرد بەو شێوەیە لەگەڵ نوێنەرەکانی من هەڵس و کەوتت کرد؟ نەوفلی وتی: کارێکی هەڵەم کرد. ئەحمەد وتی: بەڵام من کارێکی راست سەبارەت بەتۆ ئەنجام دەدەم. دواتر فەرمانیدا و خوێنیان ڕشت.

ئەحمەدی خوجوستانی ئاگادار بوویەوە کەئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە لەمەرو، لەماوەی دوو ساڵ، پانزە جار باجی لەدانیشتوانی ئەو شارە وەرگرتووە. ئەو کە لەئەبیوەرد بوو، بەخێراییەکی ئەوتۆ ئەسپی غاردا کە لەماوەی یەك شەو و ڕۆژ خۆی گەیاندە مەرو. ئیبراهیمی لەناو جێگەکەی گرت و لەمەرو مایەوە و باجەکانی لێ سەندەوە. موسای بەڵخی وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان کرد. دواتر حسەین کوڕی تاهیر هاتە ئەو شارە و ڕێگەی چاکەکاری گرتەبەر و بیست هەزار درهەمی دەستکەوت.

## چۆنیەتی کوژرانی خوجوستانی

کاتێك ئەحمەدی خوجوستانی لەتەخارستان بوو، هەواڵی کوژرانی دایکی لەنەیشابور، پێ گەیشت. ئەو بەخێرایی کەوتەخۆ. کاتێك لەهەرات نزیك کەوتەوە، یەکێك لەکۆیلەکانی باوکی تەڵحە بەناوی یەنالی دە هەزار، پەنای بۆ برد. هەواڵی باوکی تەڵحەی زووتر پێگەیشتبوو. خۆجوستانی کۆیلەیەکی بوو بەناوی رامەجور. خوجوستانی ئەوی وەك لێپرسراوی گەنجینە دەستنیشان کردبوو. خوجوستانی بەگاڵتە بەکۆیلەکەی خۆی وت: سەروەری تۆ، یەنای دەهەزار هاتووە و داوای پەنا لەمن دەکات، بزانە چۆن میوانداری دەکەیت. رامجور ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و ترسا لەوەی خوجوستانی پێگەیەکی بەرزتر بەو کۆیلەیە ببەخشێت. لەبەر ئەمە بەدوای دەرفەتێکی گونجاو دەگەڕا تا خوێنی خوجوستانی بڕێژێت.

ئەحمەدی خوجوستانی کۆیلەیەکی دیکەی بوو بەناوی قەنلەغ کەشەرابی بۆ تێدەکرد. ڕۆژێك قەلنەغ شەرابی بۆ تێکرد. ئەحمەد لەناو پیاڵەکە شتێکی بینی و

فەرمانیدا یەك چاوی دەربێنن. قەلنەغ و رامجور بڕیاریاندا ئەحمەد بکوژن. ڕۆژێك ئەحمەد لەکاتی هاتنەوە لەتایکانی نەیشابور، مەست و سەرخۆش خەوتبوو، هاوڕێکانی ئەویان بەتەنیا جێهێشتبوو. بەمشێوەیە رامجور و قەلنەغ خوێنیان ڕشت. ئەم پێشهاتە لەشەوالی ٢٦٨/ ئاوریلی ٨٨٢ زایینی روویدا. رامجور ئەنگوستیلەکەی ئەوی دەرهێنا و بردیە ئاخوڕی ئەسپەکان. داوای لەلێپرسراوی ئەسپەکان کرد چەند ئەسپێك زین بکات. ئەو کارەیان کرد. ئەو چەند سوارێکی بۆ لای باوکی تەڵحە لەگورگان ناردبوو بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەنەوە و داوای لێ بکەن بۆ لای ئەوان بەرێکەوێت. رامجور دەرگای لەسەر ئەحمەد خوجوستانی بەست و خۆی شاردەوە.

سەرکردەکان بەرەبەیان هاتنە بارەگای ئەحمەد و بینیان داخراوە. ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بوون. سەرئەنجام بەدگومان و دەرگاکەیان کردەوە و بینیان ئەحمەد مردووە. دەستیان بەلێکۆڵینەوە کرد. لێپرسراوی ئاخوڕ ئەوانی لەڕەوانە کردنی ئەنگوستیلە بەدەستی رامجور ئاگادار کردەوە. شوێنپێی رامجوریان هەڵگرت بەڵام نەیاندۆزییەوە و دوای ماوەیەك ئەویان گرت.

چۆنیەتی گرتنی ئەو بەم شێوەیە بوو: ڕۆژێك منالێك لەمالێك هاتەدەر و بەدوای ئاگردا دەگەڕا. پێیان وت: لەم ڕۆژە گەرمەدا ئاگرت بۆ چییە؟ وتی: خواردن بۆ گەورەمان دروست دەکەین. وتیان: گەورەتان کێیە؟ وتی: رامجور. یەکێك لەسەرکردەکانیان ئاگادار کردەوە. بەمشێوەیە ئەویان گرت و خوێنیان ڕشت.

هاوەڵانی ئەحمەدی خوجوستانی دوای کوشتنی ئەو، رافیع کوڕی هەرسیمەیان هەڵبژارد. گێڕانەوەکان سەبارەت بەرافیع لەساڵی ٨٨٢/٢٦٨ زایینی باس دەکەین.

ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلە کاتێك دوای کوژرانی دایکی لەتایکان بۆ نەیشابور گەڕایەوە. ڕمێکی درێژی لەزەوی چەقاند و وتی: خەڵکانی نەیشابور دەبێت هاوشێوەی مرواری بەدەوری ئەم ڕمەدا بڕێژن بەشێوەیەك چیتر ڕمەکە دیار نەبێت. نەیشابورییەکان ترسان و دەستەیەك لەگەورەکان و بازرگانەکان خۆیان شاردەوە. خەڵکان دەستیان بەپاڕانەوە کرد و لەباوکی عوسمان و هاوەڵانی دیکەی باوکی حەفس داوایان کرد لەدەرگای خواوەند بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی لەم بەڵایە ڕزگاریان

بێت. ئەو کارەیان کرد و خواوەند بەزەیی و رەحمەتی خۆی بەسەردا باراندن.

ئەحمەد کوڕی عەبدوللە هەمان شەو کوژرا و خەڵکانی نەیشابور رزگاریان بوو.

ئەحمەد، جوامێر، بەخشندە، بوێر و چاکەکار بوو. چاکەی زۆری لەگەڵ ئەو کەسانە دەکرد کەچاکەیان لەگەڵ دەکرد. لەبەرابەر ئەوان کەسێکی لەخۆبوردوو بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی محەممەد کوڕی باوکی شەوارب وەك قازی هەڵبژێردرا.

لەسەفەر/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، حسەین کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر بەرەو کوردستان و لوڕستان بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا سەلانی فەرمانڕەوای ڕەی مرد و کەیغەلەغ جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا سامانی کوڕی زەیدویەی پزیشك تالآن کرا.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی عەلی کوڕی یەعقوب کوڕی مەنسور مرد.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی ئیسحاقی دادوەری بەشی ڕۆژهەلآتی بەغدادی گرتە ئەستۆ و بەم شێوەیە وەك قازی هەردوو بەشی بەغدادی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد موەفەق لەگەڵ ئەحمەد کوڕی تولون، فەرمانڕەوای میسر، رێگەی ناسازگاری گرتەبەر و پەیمانی نێوان ئەوان لاواز بوو. موەفەق بڕیاریدا کەسێکی دیکە وەك فەرمانڕەوای میسر دیاری بکات بەلآم کەسی نەدۆزییەوە چوونکە کۆیلە و دیارییەکانی ئەو بەردەوام دەگەیشتە سەرکردە و سالارەکانی بەغداد و لەبەر ئەمە کەسی بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی میسر نەبینی. نامەیەکی بۆ کوڕی تولون نووسی و هەڕەشەی لابردنی لێکرد. وەلآمەکەی کوڕی تولون توند و تیژ بوو. موەفەق موسا کوڕی بوغای لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. بوغا رێگەی رەققەی گرتەبەر. کوڕی تولون لەم جموجۆڵە ئاگادار بوویەوە و چواردەوری میسری گرت. موسا کوڕی بوغا دە مانگ لەرەققە مایەوە بەلآم لەبەر کەمی خواردن، توانای ڕۆشتنە ناو میسری نەبوو. سوپاییەکان داوای ڕۆژانەی خۆیان کرد بەلآم سامانی بەسەندەی پێ نەمابوو.

لەبەر ئەمە سوپا رێگەی ناسازگاری گرتەبەر و دژی عەبدوللە کوڕی سلێمان شۆڕشیان کرد. سلێمان خۆی شاردەوە و موسا کوڕی بوغا بەناچاری بۆ عێراق گەڕایەوە. خواوەند شەڕی ئەوی لەسەر ئەحمەد کوڕی تولون هەڵگرت. ئەحمەد سامانێکی زۆری وەك خێر بەخشییەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عیتاب کەبەرەو نەسیبین دەڕۆشت، کوژرا. نەسیبین لەسنوری ئەودا بوو. عەرەبەکان ئەویان کوشت.

لەم ساڵەدا قەتان، هاورێی موفلیح و فەرمانڕەوای موسڵ کوژرا. ئەو لەموسڵ بەرەو رەققە دەگەڕایەوە و لەهەمان جێ، گیانیان گرت. هەروەها لەم ساڵەدا عەلی کوڕی حسەین کوڕی داود، کەفتەمەری لەسەر رێگەی مەککە دانا.

هەروەها لەم ساڵەدا لەرۆژی ترویە (لەرێ و رەسمەکانی حەج) لەنێوان خەیاتەکان و قەسابەکان لەمەککە شەڕێکی ئەوتۆ روویدا کەخەڵکان لەبەتاڵ بوونەوەی حەجەکەیان ترسان. دواتر دەستیان لەجەنگ هەڵگرت تا خەڵکان رێ و رەسمی حەج بەجێبێنن. حەڤدە کەس لەوان کوژرا.

فەزڵ کوڕی ئیسحاق کوڕی حەسەن کوڕی عەباس کوڕی محەممەد، رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، مونزەری کوڕی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی جەلیقی ڕەوانە کرد. جەلیقی لەبەتلیموس بوو. کاتێك لەهاتنی مونزەر ئاگادار بوویەوە، لەوێ ڕۆشت و لەقەڵای کەرکەر سەنگەری گرت. لەوێش ئاکاوگیر کرا و لەمانگی شەوال/ ژوئەن، ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی شەبهی نەمیری ئەخباری مرد. لەساڵی ٧٨٩/١٧٣ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەدو شەست و سێی کۆچی ( ٨٧٧ زایینی )

### چۆنیەتی جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان

کاتێك عەلی کوڕی ئەبان بەبریندارى هەڵات و بۆ ئەهواز گەڕایەوە، لەوێ نەمایەوە و ڕۆشتە لای ساحەبی زەنج تا چارەسەری برینەکانی بکات. کەسێکی وەك جێگری خۆی بۆ سوپاکەی ئەهواز دانا. کاتێك برینەکەی باش بوویەوە، بۆ ئەهواز گەڕایەوە و خەلیل کوڕی ئەبانی برای لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەحمەد کوڕی لەیسویە ڕەوانە کرد. ئەحمەد لەعەسکەر موکەرەم بوو. ئەحمەد بۆسەی بۆ ئەوان نایەوە و خۆی بۆ جەنگی ئەوان بەڕێکەوت. دوو سوپا جەنگێکی قورسیان دەستپێکرد. لەم کاتەدا ئەو کەسانەی بۆسەیان دانابوو، هێرشیان کردە سەر زەنگییەکان. زەنگییەکان هەڵاتن و بڵاوەیان لێکرد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. هەڵاتوان لەدەوری عەلی کوڕی ئەبان کۆبوونەوە. ئەو دەستەیەکی بۆ مەسروقان ڕەوانە کرد. ئەحمەد سی سوار لەهاوەڵە هەڵبژێردراوەکانی خۆی بۆ جەنگی ئەم دەستەیە نارد بەڵام زەنگییەکان ئەوانیان کوشتار کرد.

### چۆنیەتی زاڵبوونی یەعقوب لەئەهواز و ناوچەکانی دیکە

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیس لەفارسەوە هات، کاتێك گەیشتە نەوبەندجان، ئەحمەد کوڕی لەیس لەشوشتەر گەڕایەوە. کاتێك یەعقوب گەیشتە جوندیشاپور و ئوردووی لێدا، هەموو سەربازەکانی ئوردووگای خەلیفە ئەو ناوچەیان بەجێهێشت. یەعقوب پیاوێك لەهاوەڵانی بەناوی خزر کوڕی عەنبەر بەرەو ئەهواز ڕەوانە کرد. کاتێك خزر لەو سەرزەمینە نزیك کەوتەوە، عەلی کوڕی ئەبان و زەنگییەکان ناوچەکەیان چۆڵ کرد و لەکەناری ڕووباری سەدرە ئوردوویان لێدا. خزر ڕۆشتە ناو ئەهواز. سوپاکەی خزر و سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبان هەندێ کات بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر یەك تا ئەوەی عەلی کوڕی ئەبان خۆی

ئامادە کرد و رێگەی ئەهوازی گرتەبەر. شەڕێکی قورس لەنێوان سوپاکەی ئەو و سوپاکەی خزر روویدا و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی خزر کوژران. عەلی تالآنی زۆری دەستکەوت. خزر و سوپاکەی بۆ عەسکەر موکەرەم هەلآتن.

عەلی لەئەهواز مایەوە و هەموو سامانی ئەو سەرزەمینەی تالآن و بۆ رووباری سەدرە گەڕایەوە و دەستەیەکی بۆ دورەق نارد. ئەوان لەوێ لەگەڵ سوپاکەی یەعقوب جەنگان. یەعقوب هێزی پشتیوانی بۆ هاوکاری سوپاکەی خزر ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەشەڕ لەگەڵ زەنگییەکان دەست هەڵگرێت و تەنیا بەمانەوە لەئەهواز بەسەندە بکات بەلآم عەلی رازی نەبوو مەگەر ئەوەی خواردەمەنییەکان بۆ شوێنەکەی ئەو ڕەوانە بکرێت. یەعقوب رازی بوو و خواردەمەنییەکانی بۆ عەلی ڕەوانە کرد. تەنیا ئالیکی ئەهوازی ڕەوانە نەکرد و بەمشێوەیە دوو سوپا دەستیان لەجەنگ هەڵگرت.

## زاڵبوونی رۆم بەسەر لۆلۆ

لەم ساڵەدا سەقلەبییەکان شاری لۆلۆیان بەرۆمییەکان سپارد. هۆکارەکەی ئەوە بوو ئەحمەد کوڕی تولون پێش گرتنەدەستی فەرمانڕەوایەتی میسر، بەردەوام سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ خەڵکانی تەرسوسدا بوو. کاتێك لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی میسر دانیشت، حەزی دەکرد فەرمانڕەوایەتی تەرسوسیش بگرێتەدەست. لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ باوکی ئەحمەد موەفەق نووسی و داوای فەرمانڕەوایەتی تەرسوسی لێکرد بەلآم موەفەق رازی نەبوو و محەممەد کوڕی هارونی تەغلەبی وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دەستنیشان کرد. محەممەد رۆژێك سواری بەلەم بوو و تۆفان ئەوی بۆ کەنارەکانی دیجلە برد. هاوەڵآنی موساوری شاری ئەویان گرت و کوشتیان. موەفەق، محەممەد کوڕی عەلی ئەرمەنی لەجێگەی ئەو دانا. موەفەق ئەنتاکیەیشی بەو سپارد بەلآم خەڵکانی تەرسوس هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. موەفەق، ئەرخوز کوڕی یولەغ کوڕی تەرخانی تورکی لەجێگەی ئەو دانا. ئەرخوز بەرەو تەرسوس بەرێکەوت. ئەو بێ ئەزموون و نەزان و خراپەکاری کردە پیشە و لەگەیاندنی خواردەمەنی بۆ خەڵکانی لۆلۆ کەمتەرخەمی دەکرد. ئەوان هاواریان

بەرز بوویەوە و نامەیان بۆ خەڵکانی تەرسوس نووسی و سکالاّیان بەرز کردەوە و وتیان: یا خواردەمەنی ئێمە دەنێرن یا قەلاّکەمان تەسلیم بەڕۆمییەکان دەکەین.

ئەمە لای خەڵکانی تەرسوس گران و دژوار بوو. لەناو خۆیان پانزە هەزار دیناریان کۆکردەوە و بۆ خەڵکانی ئەو شارەیان نارد. ئەرخوز پارەکانی وەرگرت تا تەسلیم بەخەڵکی شارەکەی بکات بەلاّم هەڵیگرت بۆ خۆی.

کاتێك پارەکە بەدەستی خەڵکانی لۆلۆ نەگەیشت، قەلاّکەیان بەرۆمییەکان سپارد. ئەمە بووە هۆی ترسی خەڵکانی تەرسوس چوونکە ئەم قەلاّیە وەك ئێسقانێك بوو لەقورگی دوژمندا. لەم قەلاّوە دەیانتوانی هەموو جموجۆڵی رۆمییەکان لەدەریا و وشکایی ببینن و هەموان ئاگادار بکەنەوە.

موعتەمید لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە و بەناچاری ئەو دیارەی بەسامان کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون سپارد و ئەوی بۆ جەنگی رۆمییەکان و پارێزگاری کردنی ئەو سنورە رەوانە کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا موساوری شاری مرد. ئەو لەبوازیج بۆ رووبەروو بوونەوەی سوپای خەلیفە بەرێکەوت. هاوەلاّنی ئەو دوای مەرگی موساور، نامەیەکیان بۆ محەممەد کوڕی خەرزاد لەشارەزوور نووسی و ئەویان وەك فەرمانڕەوای خۆیان دیاریکرد بەلاّم ئەو رازی نەبوو. محەممەد پیاوێکی خۆپارێز بوو. دەستی بەیعەتیان بۆ ئەیووب کوڕی حەیانی وارقی بیجلی درێژ کرد. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی خەرزاد پەیکی نارد و وتی: لێکۆڵینەوەی لەپێشنیارەکەی ئەوان کردووە و ناتوانێت بۆ ئەم کارە سستی لەخۆی نیشان بدات چوونکە موساور پێشتر بەیعەتی لێ وەرگرتبوو. پێیان وت: ئێمە بەیعەتمان لەگەڵ ئەو پیاوە بەستووە و رێز لەبەیعەتەکەی خۆمان دەگرین. محەممەد کوڕی خەرزاد لەگەڵ ئەو کەسانەی بەیعەتیان لەگەڵ کردبوو، بەرێکەوت و لەگەڵ ئەوان جەنگی. لەم ناوەدا ئەییوب کوڕی حەیان کوژرا. ئەوان دوای کوژرانی ئەیوب لەگەڵ محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی یەحیای وارقی ناسراو بەغولام بەیعەتیان بەست بەلاّم ئەویش کوژرا. هاوەلاّنی موساور بەیعەتیان لەگەڵ هارون

کوڕی عەبدوڵڵەی بیجلی کرد. شوێنکەوتەکانی ئەو فراوان بوون. کوڕی خەرزاد لەجەنگی ئەو خۆی بەدوور گرت و هارون دەستی بەسەر کەنارەکانی موسڵدا گرت و باجی لێ وەرگرتن.

لەم ساڵەدا لەنێوان موسا کوڕی بوغا و عەرەبە بیابان نشینەکان جەنگ روویدا و موەفەق، کوڕەکەی باوکی عەباس موعتەزیدی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان ڕەوانە کرد تا شوێنپێی عەرەبەکان هەڵبگرن.

لەم ساڵەدا دەیرانی دژی کوڕی ئەوس شۆڕشی کرد و شەوانە ئەوی گرت. سوپاکەی کوڕی ئەوس بڵاوەی لێکرد و دەیرانی، سامانەکانی ئەویان تاڵان کرد. کوڕی ئەوس بۆ واست هەڵات.

لەم ساڵەدا هاوەڵانی یەعقوبی لەیس بەسەر محەممەد کوڕی واسڵ زاڵبوون و ئەسیریان کرد.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی یەحیای خاقان، وەزیری موعتەمید، بەهۆی بەرکەوتنی ئەسپەکەی لەگەڵ ئەسپی کۆیلەکەی، لەمەیدان کەوتەخوار و مێشکی لەلوت و گوێچکەی هاتەدەر و دەستبەجێ گیانی سپارد. موەفەق نوێژی لەسەر خوێند و بەدوای جەنازەکەی بەرەو گۆڕستان ڕۆشت و دوو ڕۆژ دوای ئەو حەسەن کوڕی مەخلەدی لەجێگەی ئەودانا. کاتێك موسا کوڕی بوغا گەیشتە سامەرا، حەسەنی وەزیر خۆی شاردەوە و بەناچاری سلێمان کوڕی وەهب وەك وەزیر دیاریکرا.

کۆشکی عوبەیدالللەی وەزیر، بەکەیغلەغ بەخشرا.

لەم ساڵەدا براکەی شورکەب، حسەین کوڕی تاهیری لەنەیشابور دەرپەڕاند و دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت و خەڵکەکەی ناچار کرد سێ یەکی سامانەکانی خۆیان بەو بدەن. حسەین بۆ مەرو هەڵات. مەرو لەژێر فەرمانی خوارەزمشادا بوو کەبانگەوازی بۆ محەممەد کوڕی تاهیر دەکرد.

لەم ساڵەدا محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، مونزەری کوڕی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ناباوەڕان ڕەوانە کرد. کاتێك لەرێگەی ماردە گوزەری کرد و گەیشتە سەرزەمینی ناباوەڕان، نۆسەد شاسوار هاوڕێیەتیان دەکرد کە

لەناکاو دەستەیەکی گەورە لەناباوەڕان هێرشیان کردەسەر و شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان دەستی پێکرد. مونزەر خۆڕاگری کردە پیشە و ژمارەیەکی زۆر لەناباوەڕان کوژران. دواتر کوڕی جەلیقی و هاوەڵانی و حەوتسەد کەس لەناباوەڕان شمشێر بەدەست تۆوی مەرگیان لەناو سوپاکەی مونزەردا بڵاو کردەوە و کوژران.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، دروست کردنی شاری ڕەقادەی دەست پێکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی حەربی تائی موسڵی برای عەلی کوڕی حەرب لەئازەنە لەشارە سنورییەکان تێپەڕی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەست و چواری کۆچی ( ٨٧٨ زایینی )

## چۆنیەتی ئەسیر کرانی عەبدوڵڵە کوڕی کاوس

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان عەبدوڵڵە کوڕی ڕەشید کوڕی کاوسیان ئەسیر کرد. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کەئەو لەگەڵ چوار هەزار سوار لەدانیشتوانی سنوورەکانی شام ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ڕۆم و تالآنی کردە پیشە و ئەوەی بینی، خوێنی ڕشت. کاتێك لەبەدەندون گوزەری کرد، بەتریقی سەلوقیە و بەتریقی قەرە کەوکەب هاتنەدەر و دەوریان گرت. موسوڵمانان دابەزین و قاچی چوارپێکانی خۆیان بڕییەوە و جەنگێکی بوێرانەیان دەست پێکرد و جگە لەپێنسەد کەس هەموویان کوژران. هاوشێوەی یەك کەس هێرشیان کرد و سەرئەنجام ئەوەی چوارپێی دەستکەوت، سواری بوو و هەڵات. ڕۆمییەکان تا ئەو جێگەی توانیان خوێنی موسوڵمانانیان ڕشت. عەبدوڵڵە کوڕی ڕەشیدیان بەبریندای ئەسیر کرد و ڕەوانەی بارەگای پاشای ڕۆمیان کرد.

## چۆنیەتی ڕۆشتنی زەنگییەکان بۆ واست

لەڕووداوەکانی ساڵی ٢٦٢/٨٧٦ زایینی، ئاماژەمان بەهاتنی سلێمان کوڕی جامع بەرەو بەتائیح و بەسەرهاتی ئەومان لەگەڵ ئەغرتەمش باس کرد. کاتێك سلێمان شکستی پێهێنا، نامەیەکی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و داوای مۆڵەتی لێکرد بڕواتە لای تا هەم چاویان بەیەك بکەوێت و هەم کاروباری بارەگاکەی سامان بدات. ئەویش مۆڵەتی پێدا. حەیاتی [١٢]پێشنیاری پێکرد ڕووبکاتە ئوردووگای تەکینی بوخاری لەیەزدود. سلێمان ڕازی بوو و بەرەو یەزدود ئەسپی غاردا. کاتێك گەیشتە یەك فەرسەنگی ئەو، حەیاتی پێی وت: باشتر وایە لێرە بمێنیتەوە و من لەگەڵ بەلەمە جەنگییەکان بڕۆم و دوژمن بەرەو لای تۆ بێنم و کاتێك دەگەنە لای

---

[١٢] لەمێژووی تەبەری بەجەبائی ناوی هاتووە و ڕاستتر بەرچاو دەکەوێت. (وەرگێڕ)

تۆ، شەکەت و ماندوو بن. ئەوسا تۆ بەمەبەستەکەی خۆت دەگەیت.

سلێمان ئەو کارەی کرد و فەرمانی بەدەستەیەك لەسوپاکەیدا بۆسە بنێنەوە. حەیاتی بەرەو تەکین بەرێکەوت و کاژێرێك لەگەڵی جەنگا. دواتر پاشەکشێی کرد و ئەوان شوێنی کەوتن. کەسی بۆ لای سلێمان نارد و ئاگاداری کردەوە. دواتر بەهەمان شێوە کەنیشانی دەدا هەڵدێت، بەو شێوەی سوپاکەی تەکین ببیستن و تەماحیان لای دروست ببێت، هاواری کرد: ئێوە فریوتان دام و لەناوتان بردم، من رێگەی هاتنە ناوەوەی ئێوە بۆ ئێرە گرت بەڵام ئێوە خۆتان بەدوور گرت و چیتر هیچ رێگەیەك بۆ رزگاری خۆم نابینم.

سوپاکەی تەکین تەماحیان لا دروست بوو و بۆ گرتنی ئەو هەوڵیاندا و هاواریان کرد: بولبول کەوتە ناو قەفەس. بەم شێوەیە لای بۆسەکانەوە گوزەریان کرد و لەئوردووگاکەی سلێمان نزیك بوونەوە. سلێمان لەپشت دیوارەکانەوە سەربازەکانی دانابوو. سلێمان لەگەڵ هاوەڵانی خۆی هاتەدەر و رووبەروویان بوویەوە. ئەو کەسانەی بۆسەیان دانابوو خۆیان ئاشکرا کرد و حەیاتی دەوریدان و شەڕ دەستی پێکرد. هاوەڵانی تەکین هەڵاتنیان دەست پێکرد و زەنگییەکان تا سێ فەرسەنگ شوێنیان کەوتن و خوێنیان ڕشتن و سامانەکانیان تاڵان کرد و گەڕانەوە.

کاتێك شەو داهات، بۆ ئوردووگاکەیان گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەریان. تەکین و سوپاکەی خۆڕاگرییان کردە پیشە و سلێمان هەڵات و دووبارە سوپاکەی کۆکردەوە. فەرمانی بەدەستەیەکدا لەیەك قۆڵەوە هێرش بکەنە سەر تەکین و دەستەیەك لەرێگەی ئاو و خۆی لەگەڵ دەستەیەکی دیکە هێرشیان کرد و دەوریانگرت. هیچ کام لەسەربازەکانی تەکین لەناو ئوردووگاکەیدا نەما و هەموان هەڵاتن. زەنگییەکان تاڵان کردنیان دەست پێکرد و لەگەڵ تاڵانییەکان گەڕانەوە. سلێمان، حەیاتی وەك جێگری خۆی لەسەر سوپاکەی دەستنیشان کرد و خۆی بۆ سەردانی ساحەبی زەنج بەرێکەوت. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٨٧٧/٢٦٣ زایینی روویدا.

کاتێك سلێمان بۆ بینینی ساحەبی زەنج بەرێکەوت، حەیاتی لەگەڵ ئەو

سوپایەی سلێمان خستبوویە بەردەستی، بۆ دەستخستنی خواردەمەنی بەرەو مازوران بەرێکەوت بەڵام جەعلان ڕێگەی لێگرت و دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. دوو سوپا جەنگیان دەستپێکرد، سوپاکەی حەیاتی شکستی خواردو دەستیان بەسەر کەشتییەکاندا گرت. حەیاتی ئاگادار بوویەوە کەمەنجور و محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەبیبی یەشکوری گەیشتوونەتە حەجاجییە. ئەم هەواڵەی بۆ ساحەبی زەنج نووسی. ساحەبی زەنج، سلێمانی ڕەوانە کرد. سلێمان بەخێرایی خۆی گەیاندە تەهسا و وای نیشاندا مەبەستی جەعلانی هەیە. ئەو حەیاتی لەپێشەوە نارد و فەرمانی پێدا بەرەو جەعلان بڕوات و خۆی نیشان بدات بەڵام نەجەنگێت.

سلێمان بەخێرایی خۆی بەمحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەبیب گەیاند و جەنگێکی بەرفراوانی دەست پێکرد و تالآنی زۆری دەستکەوت و برای محەممەد کوڕی عەلی کوشت و گەڕایەوە. ئەم پێشهاتە لەمانگی رەجەب/ مارسی ئەم ساڵە ڕوویدا.

دواتر سلێمان لەشەعبان/ ئاوریلی ئەم ساڵە هێرشی کردە سەر گوندی حەسان. فەرماندەی ئەم گوندە حەسەن کوڕی خەماری تەکین بوو.

سلێمان ڕووبەڕووی بوویەوە و شکستی پێهێنا و ئەوەی بووی، فڕاندی و گوندەکەی سوتاند و گەڕایەوە.

سلێمان لەم مانگەدا هێرشی کردە سەر چەندین ناوچەی دیکە و تالآنی زۆری دەستکەوت و گەڕایەوە. لەرمەزان/ مەی، وای نیشاندا مەبەستی جەنگی جەعلانی لەمازوران هەیە. جەعلان لەجموجۆڵی ئەو ئاگادار بوویەوە. جەعلان سوپاکەی خۆی ڕازاندەوە بەڵام سلێمان ئەوی پشتگوێ خست و ڕوویکردە ئەبا و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو جەنگی دەستپێکرد و شەش کەشتی جەنگی وەك تالآنی دەستکەوت. دواتر حەیاتی لەگەڵ دەستەیەك بۆ تالآن کردن ڕەوانە کرد بەڵام ڕووبەڕووی سوپاکەی جەعلان بوونەوە. جەعلان کەشتییەکانی وەرگرت و تالآنی زۆری لەوان بەدەست هێنا. سلێمان لەوشکیدا هێرشی کردە سەر جەعلان و ئەوی کوشت و کەشتییەکانی وەرگرتەوە. هەروەها بڕێکی زۆر کالآی تالآن کرد و

گەڕایەوە.

دواتر لەزیقەعدە/ جولای، سلێمان ڕێگەی ڕوسافەی گرتەبەر و لەوێ ڕووبەڕووی مەتەر کوڕی جامع بوویەوە وتالآنی زۆری دەستکەوت. ڕوسافەی سوتاند و هەموو خراپەکارییەکی لەو شارەدا بەڕەوا زانی.

ئەو لەگەڵ ئالآکانی خۆی ڕۆشتە ناو شاری ساحەبی زەنج و لەوێ مایەوە تا سەرێك لەماڵەکەی خۆی بدات. لەم کاتەدا مەتەر ڕوویکردەو حەجاجییە و ڕووبەڕووی دانیشتوانەکەی بوویەوە و ژمارەیەکی ئەسیر کرد. سلێمان لەوێ قازی دانابوو. مەتەر قازییەکەی ئەسیر و بۆ واسیتی برد. مەتەر تانزیکی تەهسا ڕۆشتە پێش و گەڕایەوە. حەیاتی ئەم هەواڵەی بۆ سلێمان نووسی و ئەو لەدووی زیحەجەی ٢٦٣/ حەڤدەی ئۆگۆستی ٨٧٧ زایینی ڕووبەڕووی مەتەر بوویەوە. جەعلانیش گەڕایەوە و خۆی بەئەحمەد کوڕی لەیسویە گەیاند و لەشەدیدیە ئوردوی لێدا.

لەو کاتە ئەحمەد کوڕی لەیسویە ڕۆشتبووە کوفە و جونەبەلا. تەکین هێرشی کردە سەر سلێمان و کەشتی و کالآکانی لێ سەندەوە. سەران و سەرکردەکانی سلێمان لەم کەشتیانەدا بوون و هەموویان بەدەستی تەکین کوژران. دواتر محەممەد بۆ شەدیدیە گەڕایەوە و کاروبارەکانی ئەو ناوچەی سەقامگیر کرد تا ئەوەی محەممەد کوڕی مەولەد هات. موەفەق ئەوی وەك فەرمانڕەوای واست دیاریکردبوو. سلێمان نامەیەکی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. ساحەبی زەنج، خەلیل کوڕی ئەبانی لەگەڵ هەزار و پێنسەد سوار بۆ هاوکاری ئەو نارد. کاتێك هێزی هاوکاری پەیوەستی سلێمان بوو، بۆ جەنگی محەممەد کوڕی مەولەد بەڕێکەوت و سلێمان ڕۆشتە ناو شاری واست و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانەکەی کوشت و سامانەکانی تالآن کرد و سوتاندی. فەرمانڕەوای ئەم شارە واست کوڕی مەنکجوری بوخاری بوو کەدوای نیمەڕۆ ڕووبەڕووی سلێمان بوویەوە بەلآم سەرئەنجام کوژرا. سلێمان لەواستەوە ڕووی کردە جونەبەلا تا دووبارە گەمە بەهەموو شتێك بکات و وێرانی بنێتەوە. ئەو نۆ شەو لەوێ مایەوە. لەکاتێکدا سوپاکەی لەڕووباری ئەمیر ئوردووی لێدابوو.

## وەزارەتی سلێمان کوڕی وەهب و حەسەن کوڕی مەخلەد و چۆنیەتی لابردنی ئەو

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی وەهب لەبەغدادەوە بەرەو سامەرا بەرێکەوت و موەفەق لەگەڵ سەرکردەکان، بەرێیان کرد. کاتێك گەیشتە سامەرا، موعتەمید لێی توڕە بوو و زیندانی کرد. فەرمانیدا ماڵەکەی خۆی و دوو کوڕەکەی وەهب و ئیبراهیم تالاَن بکەن و لەمانگی زیقەعدە/ جەولای، حەسەن کوڕی مەخلەدی وەك وەزیر دەستنیشان کرد.

کاتێك موعتەمید ئەو کارەی کرد، موەفەق لەگەڵ لەگەڵ عوبەیدالله کوڕی سلێمان کوڕی وەهب لەبەغدادەوە ڕێگەی سامەرای گرتەبەر. کاتێك لەسامەرا نزیك کەوتەوە، موعتەمید لەبەشی ڕۆژهەلاَت ئوردووی لێدا و لەموەفەق، توڕە بوو. نوێنەرەکان موەفەق و موعتەمید هاتوچۆیان کرد تا ئەوەی سەرئەنجام ڕێککەوتن. موعتەمید بەموەفەق و مەسرور و کەیغەلغ و ئەحمەد کوڕی موسا کوڕی بوغا خەلاَتی بەخشی و سلێمان کوڕی وەهبی ئازاد کرد و بۆ کۆشکەکەی گەڕایەوە. لەم کاتەدا حەسەن کوڕی مەخلەد و ئەحمەد کوڕی ساڵحی شێرزاد هەلاَتن و فەرمان درا دەست بەسەر سامانەکانیاندا بگرن و ئەحمەد کوڕی باوکی ئەسبەغ قۆلبەست بکەن. ئەو سەرکردانەی لەسامەرا هاوڕێیەتی موعتەمیدیان دەکرد لەترسی موەفەق هەلاَتن و خۆیان گەیاندە موسڵ. کاتێك گەیشتنە ئەو سەرزەمینە، باجی ئەو ناوچەیان کۆکردەوە.

## هەواڵی مەرگی ئەماجور و زاڵبوونی کوڕی تولون لەشام و تەرسوس و کوژرانی سیمای بالاَبەرز

لەم ساڵەدا ئەماجور، کارگوزاری دیمەشق، مرد و کوڕەکەی جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەحمەد کوڕی تولون سوپای ڕازاندەوە تا هێرش بکاتە سەر شام و ئەو سنورە بخاتە ژێر فەرمانڕەوایەتی خۆی. نامەیەکی بۆ کوڕی ئەماجو نووسی

کەخەلیفە کارگوزاری شام و سنورەکانی بەو داوە. کوڕی ئەماجو بەقسەکەی ڕازی بوو. ئەحمەد بەرێکەوت و عەباسی کوڕی وەك فەرمانڕەوای میسر دانا. کاتێك ئەحمەد گەیشتە ڕەملە، کوڕی ئەماجور بۆ بینینی ڕۆشت و ئەو سەرئەنجام کوڕی ئەماجوری وەك فەرمانڕەوای ڕەملە دەستنیشان کرد و بەرەو دیمەشق بەرێکەوت و دەستی بەسەردا گرت و لەوێوە ڕوویکردە حیمس و دەسەلاتی بەسەر ئەو ناوچەیشدا بلاو کردەوە و حەمات و حەلەبی هێنایە ژێر فەرمانی خۆی.

ئەو نامەیەکی بۆ سیمای بالابەرز لەئەنتاکیە نووسی و پێشنیاری فەرمانبەری خۆی پێکرد و ئەگەر ڕازی ببێت ئەو وەك فەرمانڕەوای ئەنتاکیە دەهێڵێتەوە بەلام سیما ڕازی نەبوو. کوڕی تولون دووبارە نامەی بۆنووسی و ئەمجارەیش سیما ڕازی نەبوو. ئەحمەد بەرێکەوت و لەئەنتاکیە گەمارۆی خستە سەر سیما. کردەوەکانی سیما لەگەڵ دانیشتوانی ئەم شارە نەشیاو بۆ ڕازی بوون بوو و لەبەر ئەمە خەڵکی ئەو دەڤەرە نامەیان بۆ ئەحمەد کوڕی تولون نووسی و ئەویان لەچۆنیەتی هاتنە ناو شارەکە ئاگادار کردەوە. ئەحمەد مەنجەنیقەکانی دانا و شەڕی لەگەڵ سیما کرد و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەدا و قەلاکەی سیما گرت. سیما سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی بوێرانە جەنگا و کوژرا. کەس لەکوژرانی ئەو ئاگادار نەبوویەوە تا ئەوەی یەکێك لەسەردارەکان لای ئەو گوزەری کرد وبینی کوژراوە. سەری ئەوی بردە لای ئەحمەد، بەلام ئەحمەد کوژرانی ئەوی بەناخۆش زانی.

ئەحمەد دوای ئەنتاکیە ڕێگەی تەرسوسی گرتەبەر. ڕۆشتە ناو شارەکە و لەگەڵ جەنگاوەرەکانی مەبەستی مانەوەی کرد دواتر گرانی لەو شارەدا ڕوویدا بەشێوەیەك خۆی و سوپاکەی گرفتاری دژواری بوون. خەڵکانی تەرسوس ڕۆشتنە خێوەتەکەی و وتیان: تۆ شارەکەی ئێمەت گرفتاری قات و قڕی کردووە و گرانی هاتۆتە ئاراوە، یا لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەسوپاکە بمێنەرەوە یا لەشارەکە بڕۆنەدەر. ئەم دەستەیە بەشێوەیەکی توند و تیژ قسەیان لەگەڵ کرد و لێی تووڕە بوون. ئەحمەد بەهاوەلانی وت: ئەگەر تەرسوسیەکان پشت گوێ بخەن بۆ خەڵکان و بەتایبەت دوژمنان ئاشکرا دەبێت کوڕی تولون لەگەڵ سوپاکەی، بەو هەموو

ناوبانگەوە، بارودۆخی لەخەڵکی تەرسوس دژوار نەکرد و بەم شێوەیە شارەکەی بەجێهێشت و شکۆ و مەزنی ئەو لەدڵی دوژمنان مایەوە. ئەو گەڕایەوە بۆ شام.

لەم کاتەدا هەواڵی بۆ هات عەباسی کوڕی کەوەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشانی کردبوو، دژی ئەو ئالآی شۆڕشی بەرز کردۆتەوە و سامانەکانی فڕاندووە و ڕێگەی ڕەققەی گرتۆتەبەر و ناسازگاری لەگەڵ باوکی دەکات. کوڕی تولون لەبیستنی ئەم هەواڵە ترسا و نیگەران بوو. خۆڕاگری کرد و سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەرکەکانی بوویەوە و پارێزگاری لەسنوورەکان دەکرد و سوپایەکی لەحەران بەجێهێشت. هەروەها سوپایەکی بەفەرماندەیی لۆلۆی کۆیلەی، لەڕەققە دانا. حەران لەژێر فەرمانی ئوتامشدا بوو. ئوتامش کەسێکی بوێر بوو بەلآم لۆلۆ بەریسوایی شکستی پێ هێنا.

هەواڵی بەسەرهاتی ئوتامش بەموسا کوڕی ئوتامشی برای گەیشت. ئەویش کەسێکی بوێر و جەنگاوەر بوو. سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر حەران. پادگانی کوڕی تولون بەفەرماندەیی کوڕی جەیعویە لەو شارەدا بوو. کاتێك ئەحمەد لەهاتنی موسا ئاگادار بوویەوە، ترسی لێ نیشت. عەرەبێکی بیابان نشین بەناوی باوکی ئەغەر، زیرەکی کرد و وتی: ئەی فەرمانڕەوا! دەبینم بیر لەهاتنی ئوتامش دەکەیتەوە، ئەمە پێویست بەبیرکردنەوە ناکات چوونکە پیاوێکی سەرسەری و نائارامە. ئەگەر فەرمانڕەوا بخوازێت، بەقۆڵبەستی دەیهێنمە بارەگاکەی. ئەحمەد بەتوڕەیی وتی: بەڵێ، دەمەوێت. باوکی ئەغەر وتی: بیست پیاو بخە بەردەستم کەخۆم هەڵیانبژێرم. ئەحمەد مۆڵەتی پێدا. ئەو بیست پیاوی هەڵبژارد و لەگەڵ ئەوان بەرەو ئوردووگای موسا بەرێکەوت. کاتێك نزیك کەوتەوە، فەرمانی بەچەند کەسێدا بۆسە بنێنەوە و نیشانەیان دانا تا هەرکات ئەو دەنگەیان بیست، خۆیان ئاشکرا بکەن. دواتر لەگەڵ ئەوانی دیکە بەجل و بەرگی بیابان نشینەکان ڕۆشتە ناو ئوردووگاکە و لەخێوەتەکەی موسا نزیك کەوتەوە. ڕۆشتە لای ئەسپێکی بەستراو و کردییەوە. لەگەڵ هاوڕێکانی دەنگیان بەرز کردەوە و ئەسپەکە ڕەمی کرد. باوکی ئەغەر و هاوەڵانی دەنگیان بەرز کردەوە و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەر سوپاکەی موسا. سەربازەکانی

ناو ئوردووگا بۆ دابین کردنی نیازەکانیان بەم لاولادا ڕۆشتبوون. ئوردووگا شڵەژا و هەموان سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون. موسا سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و باوکی ئەغەر لەبەرچاوی ئەو هەڵات. موسا شوێنی کەوت و لەئوردووگاکەی هاتەدەر ولای ئەو کەسانەی بۆسەیان دانابوو، گوزەری کرد. باوکی ئەغەر دەنگی بەرز کردەوە و ئەو کەسانەی بۆسەیان دانابوو، هاتنەدەر و هێرشیان کردەسەر. باوکی ئەغەر لەپشتەوە هێرشی کردە سەر موسا و ئەسیری کرد و تەسلیم بەکوڕی جەیعویەیان کرد. خەڵکان سەریان سوڕما. کوڕی جەیعویە ئەوی بۆ لای کوڕی تولون ڕەوانە کرد. ئەو موسای خستە زیندان و خۆی بۆ میسر گەڕایەوە. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٧٨٩/٢٦٥ زایینی ڕوویدا.

## شۆڕش لەسەرزەمینی چین

لەم ساڵەدا پیاوێکی نەناسراو لەچین شۆڕشی کرد و دەستەیەکی فراوان لەخراپەکارانی ئەو دەڤەری کۆکردەوە. فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە، شۆڕشەکەی ئەوی بەکەم بەها زانی بەڵام ئەو پێگەی بەرز بوویەوە و ژمارەی شوێنکەوتووەکانی زیادی کرد. هەموو خراپەکاران لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو زۆربەی ناوچەکانی تالآن کرد و لەناوی بردن. دواتر هاتە خانەقوا و گەمارۆی خستەسەر. ئەم شارە چەندین قەڵای بوو و ڕووبارێکی گەورە تێراوی دەکرد. لەم سەرزەمینەدا ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان، مەسیحییەکان، جوولەکەکان، زەردەشتییەکان و چینییەکان پێکەوە دەژیان. کاتێك گەمارۆی خستە سەر شارەکە، سوپاکەی خاقان کۆبوونەوە و ڕووبەڕووی بوونەوە بەڵام ئەو شکستی پێهێنان و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. شمشێری خستە ناو خەڵکەکەی و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن کە لەژماردن نایەت.

دواتر لەوێوە بەرەو نشینگەی خاقان بەرێکەوت و دەیویست گەمارۆ بخاتە سەر ئەو شارە. خاقانی چین ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕی نێوان ئەوان یەك ساڵ درێژەی کێشا. سەرئەنجام خاقان شکستی خوارد. ئەم شۆڕشییە شوێنپێی هەڵگرت تا ئەو جێگەی خاقان لەیەکێك لەشارە سنوورییەکانی چین پەنای گرت.

بەم شێوەیە ئەو پیاوە دەستی بەسەر زۆربەی شارەکان و گەنجینەکاندا گرت. ئەو دەیزانی ناتوانێت لەم سەرزەمینەدا بمێنێتەوە چوونکە یەکێك لەدانیشتوانی ئەوان نەبوو. لەبەر ئەمە ئەو دیارەی وێران و سامانەکانی تالآن کرد و خوێنی ژمارەیەکی زۆری ڕشت.

خاقانی چین داوای هاوکاری لەپاشاکانی هیند کرد. پاشاکانی هیند بەسوپاییەکان هاوکارییان کرد. ئەو ڕووبەڕووی پیاوی شۆڕشی بوویەوە. جەنگ بۆ ماوەی یەك ساڵ لەنێوان ئەوان بەردەوام بوو. هەردوو سوپا خۆڕاگرییان کرد. دواتر پیاوی شۆڕشی دیار نەما. دەستەیەك دەڵێن: کوژرا و دەستەیەك دەڵێن: خنکا. خاقان بەسەر سوپاکەی زاڵ بوو و بۆ سەرزەمینەکەی خۆی گەڕایەوە. نازناوی پاشاکانی چین یەغفور بوو (دەبێت فەغفور بێت) ئەم نازناوە بەمانای زادەی ئاسمانە کەبۆ ڕێز گرتن لەوان بەم ناوە بانگیان دەکردن. دوای ئەمە فەرمانڕەوایەتی ئەو هەڵوەشایەوە و هەردەستەیەك، دەستی بەسەر ناوچەیەك لەوڵاتدا گرت و چین هاوشێوەی جاران بۆ باردۆخی پاشای تیرەکان، گەڕایەوە کەهەمووان ملکەچی فەرمانی خاقان بوون. خاقانیش بەمە ڕازی بوو.

## سەرکەوتنی موسوڵمانان لەسیراکوز

لەچواردەی ڕەمەزان/ بیست ویەکی مەی ئەم ساڵە، موسوڵمانان دەستیان بەسەر سیراکوز (سەرقوسە) گرت. سیراکوز یەکێك لەگەورەترین شارەکانی سیسیل بوو.

هۆکارەکەی ئەوە بوو جەعفەر کوڕی محەممەد، فەرمانڕەوای سیسیل (سەقەلیە) دەستی بەسەر ئەم شارەدا گرت و زەوییە کشتوکاڵییەکانی لەناو برد و لەشارەکانی قەتانییە، تەبەرمین، ڕەمتە و شارەکانی دیکەی ژێر فەرمانی ڕۆمییەکان، کشتوکاڵی دەست پێکرد و لەسیراکوز دابەزی و لەوشکی و دەریاوە، دەوری گرت و دەستی بەسەر بەشێکی ئەو سەرزەمینەدا گرت. کەشتییە ڕۆمییەکان بۆ هاوکاری ئەم شارە هاتن. ئەویش کەشتییە جەنگییەکانی خۆی ڕەوانە کرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و گەمارۆی سەر شارەکەی چڕتر کردەوە.

جەعفەر بۆ ماوەی نۆ مانگ گەمارۆی خستە سەر ئەم شارە و دواتر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و چەند هەزار کەس لەدانیشتوانی شارەکەی کوشت و تالآنییەکی زۆری کۆکردەوە بەشێوەیەك پێشتر کەس تالآنی لەو شێوەی دەستنەکەوتبوو. جگە لەژمارەیەکی کەم هیچ پیاوێك رزگاری نەبوو.

ئەوان دوای گرتنی ئەم شارە، دوو مانگ لەشارەکەدا مانەوە و دواتر وێرانیان کرد. بەدوای وێران کردنی ئەم شارە، کەشتییە جەنگییەکان لەقوستەنتەنییەوە هاتن و رووبەرووی موسوڵمانان بوونەوە. موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و چوار کەشتییان دەست کەوت و هەموو سەرنشینەکانی ناو کەشتییەکانیان کوشتار کرد و لەکۆتایی زیقەعدە/ پێنجی ئۆگۆست بۆ دیاری خۆیان گەڕانەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، مونزەری کوڕی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو بەنبەلونە (پامپلونا) رەوانە کرد و فەرمانی پێدا رێگەی خۆی لەسەرقوستە (ساراگوزا) وە هەڵبژێرێت. ئەو لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شارە جەنگی و رووی کردە توتەیلە و لەسنووری مناڵەکانی موسا ئەسپی غاردا و دواتر رۆشتە پامیلونا و ژمارەیەکی زۆر لەقەڵاکانی وێران کرد و زەوییە کشتوکاڵییەکانی وێران و بێ هیچ زیانێك گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەعەرەبە بیابان نشینەکان هێرشیان کردە جەلیقیە (گالیسی) و جەنگێکی بەرفراوان دەستی پێکرد و ژمارەیەکی زۆر لەهەردوو لا کوژران.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی ئەغلەب، پاشای ئەفریقییە، لەدروست کردنی رەقادە تەواو بوو. سەرەتای دروست کردنی لەساڵی ٨٧٧/٢٦٣ زایینی بوو. کاتێك کۆتایی بەدروست کردنی هێنا، لەوێ مایەوە.

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی لەیس سوپایەکی بۆ سەیمەرە نارد. ئەوان سەعونیان گرت و بردیانە لای یەعقوب بەڵام ئەو مرد.

لەم ساڵەدا قەبیحە، دایکی موعتەز مرد.

لەم ساڵەدا تاعون لەهەموو خوراسان و قومس بڵاو بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری کوشت.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق لەگەڵ موسای هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی زەرعەی ڕازی بەناوی عوبەیدالله کوڕی عەبدئەلکەریم مرد. ئەو حافز و حەدیسی دەگێڕایەوە. محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی عولیە لەم ساڵەدا لەدیمەشق مرد.

لەم ساڵەدا باوکی ئیبراهیم موزنی، هاوڕێی شافعی، لەمیسر مرد. عەلی کوڕی حەربی تائی کە لەگێڕانەوەی حەدیس بەپێشەوا دادەنرا، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەست و پێنجی کۆچی (٨٧٩ زایینی)

### بەسەرهاتی زەنگییەکان

لەم ساڵەدا لەنێوان ئەحمەد لەیسویە و سلێمان کوڕی جامیعت، فەرماندەی زەنگییەکان لەکەنارەکانی جونەبەلا شەڕ ڕوویدا.

هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو سلێمان نامەی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و ئەوی لەبوونی ڕووبارێك بەناوی زەهری ئاگادار کردەوە و داوای مۆڵەتی لێکرد تا دەستی بەسەردا بگرێت، چوونکە ئەگەر دەستی بەسەردا دەگرت و پاکی دەکردەوە، هێنانی کاڵاکانی جونەبەلا و دەوروبەری کوفە، ئاسان دەبوویەوە. ساحەبی زەنج نەکرویەی بۆ هاوکاری ئەو نارد و فەرمانی پێدا بەردەستی سلێمان بێت و هەزینەی ئەم کارە بدات. سلێمان لەگەڵ هاوەڵانی بەرێکەوت ویەك مانگ لەشەریتە مایەوە و کاری پاککردنەوەی ڕووبارەکەیان دەست پێکرد. شوێنکەوتەکانی سلێمان لەم ماوەدا جارناجار هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی دەوروبەر. ئەحمەد کوڕی لەیسویە کەکارگوزاری موەفەق لەجونەبەلا بوو، ڕووبەڕووی سلێمان بوویەوە و چل و چەند کەس لەسەرکردەی زەنگییەکانی کوشت و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازە ئاساییەکانی کوشت. ئەحمەد کەشتییەکانی ئەوانی سوتاند وسلێمان، تێکشکاو بەرەو تەهسا بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەزەنگییەکان بەسێ بەلەمی جەنگی گەیشتنە کێوەکان و دەستیان بەسەر چوار کەشتی کەل و پەلی خواردندا گرت و گەڕانەوە.؟

لەم ساڵەدا زەنگییەکان ڕۆشتنە نەعمانییە و ئەوەی بینیان، سوتاندیان و ئەوەی گرتیان، ئەسیریان کرد و ڕێگەی جەرجەرایایان گرتەبەر. خەڵکانی دەوروبەری بەغداد، لەترسا پەنایان بۆ شارەکە برد.

## دانانی مەسروری بەڵخی لەئەهواز و شکستی زەنگییەکان لەسەر دەستی ئەو

لەم ساڵەدا موەفەق، مەسروری بەڵخی وەك فەرمانڕەوای ئەهواز دەستنیشان کرد. مەسرور، تەکینی بوخارایی وەك نوێنەری خۆی بۆ ئەو سەرزەمینە نارد. تەکین کاتێك بەرێکەوت کەعەلی کوڕی ئەبان و زەنگییەکان، گەمارۆیان خستبووە سەر شوشتەر. خەڵکانی ئەو دیارە دەترسان و بڕیاریاندا بوو شارەکەیان بەزەنگییەکان بسپێرن. لەم کاتەدا تەکینی بوخاری گەیشت و پێش ئەوەی جلەکانی داکەنێت، شەڕی لەگەڵ زەنگییەکان دەست پێکرد. عەلی و زەنگییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ئەوانیتر بلاوەیان لێکرد. تەکین ڕۆشتە ناو شوشتەر. ئەم جەنگە بەباب کورەك ناو برا و ناوبانگی لەهەموو شوێنێك بەرز بوویەوە.

دواتر دەستەیەك لەسەرکردەی زەنگییەکان هاتنە لای عەلی کوڕی ئەبان. عەلی فەرمانی پێدان لەکەناری ڕووباری فارس بمێننەوە. لەناو ئەوان کۆیلەیەکی ڕۆمی بۆ لای تەکین هەلآت و ئەوی لەشوێنی مانەوەی زەنگییەکان ئاگادار کردەوە. ئەو بەتەکینی وت هاوەلآنی عەلی لەئێستادا سەرقاڵی خواردنەوە و کۆکردنەوەی خواردنن. تەکین شەو هێرشی کردە سەریان و جەنگی دەست پێکرد و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی کوشت ئەوانیتر هەلآتن.

تەکین شوێنپێی عەلی کوڕی ئەبانی هەڵگرت بەلآم ئەو هەلآت و کۆیلەکەی لەناوی جەعفەرویە گرفتار بوو. عەلی بۆ ئەهواز گەڕایەوە. تەکین ڕێگەی شوشتەری گرتەبەر. عەلی نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێکرد کۆیلەکەی نەکوژێت. عەلی، کۆیلەکەی زیندانی کرد. دواتر لەنێوان عەلی و تەکین چەندین نامە ئاڵ و گۆڕ کرا و دیاریان بۆ یەك نارد. هەواڵی خۆنزیك کردنەوەی تەکین لەزەنگییەکان بەمەسرور گەیشت. مەسرور خۆی بەتەکین گەیاند و قۆڵبەستی کرد و ئەوی لای ئیبراهیم کوڕی جەعلان زیندانی کرد تا ئەوەی تەکین مرد و هاوەلآنی

بڵاوەیان لێکرد. دەستەیەکیان پەیوەستی زەنگییەکان بوون و دەستەیەکیان پەیوەستی محەممەد کوڕی عوبەیدالڵەی کوردی. مەسرور لەمە ئاگادار بوویەوە و ئەمانی بەهەموویان بەخشی و ئەوانی دیکە لەدەوری مەسرور کۆبوونەوە. بەشێك لەوەی لێرەدا گێڕامانەوە لەساڵی ٧٨٩//٢٦٥ زایینی و بەشێکی لەساڵی ٨٨٠/٢٦٦ زایینی روویدا.

## چۆنیەتی شۆڕشی عەباس کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون دژی باوکی

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون، دژی باوکی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: باوکی ئەو مەبەستی شامی کرد و وەك ئاماژەی پێدرا، عەباسی وەك جێگری خۆی دانا. کاتێك ئەحمەد کوڕی تولون لەمیسر دوور کەوتەوە، ئەو دەستەی لای عەباس بوون، هەڵیانخڕاند بۆ ئەوەی سامانەکان هەڵگرێت و رێگەی ڕەققە بگرێتەبەر. ئەویش ئەم کارەی کرد و لەرەبیع الاوەل/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە گەیشتە بەرقە.

باوکی لەکارەکەی ئەو ئاگادار بوویەوە و بۆ میسر گەڕایەوە و کەسی بۆ لای کوڕەکەی نارد و بەشێوەیەکی نەرم هەڵس و کەوتی لەگەڵ کرد بەڵام عەباس نەگەڕایەوە. هاوەڵانی ئەو ترسان و داوایان لێکرد رێگەی ئەفریقییە بگرێتەبەر. عەباس رێگەی ئەو سەرزەمینە گرتەبەر و لەگەڵ گەورەکانی بەربەر نامەی ئاڵو گوڕ کرد. دەستەیەك لەگەورەکان هاتنە بارەگاکەی و ژمارەیەك خۆیان بەدوور گرت. ئەو نامەیەکی بۆ ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب نووسی و وتی: سەروەری باوەڕداران بەرێوەبردنی کاروبارەکانی ئەفریقییە و دەوروبەری بەو سپاردووە. عەباس بەرێکەوت و گەیشتە لەبدە. کەسەکانی شارەکەیان بۆ کردەوە. عەباس لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شارە بەشێوەیەکی خراپ هەڵس و کەوتی کرد و هەموو سامانی ئەوانی تاڵان کرد. دانیشتوانی قەلا بۆ لای ئەلیاس کوڕی مەنسوری نفوسی، پێشەوای ئەبازییە (خەواریج) لەو کەنارە ڕۆشتن و داوای هاوکاریان لێکرد. ئەلیاس تووڕە و بۆ جەنگی عەباس بەرێکەوت. ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب سوپایەکی بۆ لای فەرمانڕەوای تەرابلوس ڕەوانە کرد و فەرمانی جەنگ دژی عەباسی پێدا. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و

شەڕێکی قورس دەستیپێکرد. عەبس خۆی شمشێری دەوەشاند.

بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە، ئەلیاس کوڕی مەنسوری ئەبازی لەگەڵ دوانزە هەزار سەرباز لەرێگەوە گەیشت. ئەو لەگەڵ فەرمانڕەوای تەرابلوس بۆ جەنگی عەباس بەرێکەوتن و ژمارەیەکی زۆری سوپاکەیان کوشت و بەریسوایی شکستیان پێهێنا. زۆری نەمابوو خۆی ئەسیر بکرێت بەڵام کۆیلەکەی ئەوی رزگار کرد. سوپاکەی ئەلیاس و فەرمانڕەوای تەرابلوس، لەشکرگەکەی ئەویانە تاڵان کرد و زۆرینەی ئەو سامانەی لەمیسرەوە هێنابووی، بەفیڕۆ چوو و بەشێوەیەکی شەرمێنەر، بۆ بەرقە گەڕایەوە.

هەواڵی شکستی عەباس لەمیسر بڵاو بوویەوە و ئەمە باوکی خەمبار کرد و خەم لەروخساری دەرکەوت. ئەحمەد کاتێك لەبارودۆخی عەباس ئاگادار بوویەوە، سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو نارد. هەر دوو سوپا خۆڕاگرییان کرد بەڵام لەکۆتاییدا عەباس و سوپاکەی شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی کوژران و عەباس ئەسیر کرا و ئەویان بردە لای باوکی؟ ئەحمەد لەژوورێکیماڵەکەی خۆی زیندانی کرد تا هاوەڵە ئەسیرەکانی دیکەی ئەو بێنن. کاتێك هەموویانیان هێنا، ئەحمەد ئەوانی لەبارەگاکەی کۆکردەوە. عەباسیش لەناویاندا دەبینرا. ئەحمەد فەرمانی بەعەباسی کوڕیدا دەست و پێی گەورەکانیان جیابکاتەوە، عەباس ئەو کارەی کرد. کاتێك کۆتایی بەکارەکەی هێنا، باوکی سەرکۆنەی کرد و وتی: ئایا فەرماندە و پێشەوا دەبێت بەم شێوەیە بێت؟ باشتر بوو خۆت دەخستە سەر قاچی من و داوات دەکرد لەگوناحی تۆ وئەوان خۆش ببم و ئەمە پێگەی تۆی بەرز دەکردەوە و بەمشێوەیە ماف ئەوانت بۆ هاوکاری کردنی خۆت و دووریان لەماڵ و منداڵیان دەگەڕاندەوە. دواتر فەرمانیدا سەد قامچی لێ بدەن. کاتێك لەژێر ئازاری قامچی دەیناڵاند، ئەحمەد فرمێسکی بۆ دەباراند. دواتر گەڕاندییەوە بۆ هەمان ژوور و زیندانی کرد. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٢٦٨/ ٨٨٢ زایینی روویدا.

## چۆنیەتی مەرگی یەعقوب و فەرمانڕەوایەتی عەمرۆی برای

لەنۆی شەوال/ حەوتی جونی ئەم ساڵە، یەعقوب کوڕی لەیسی سەفار لەجوندیشاپور لەئاوەدانییەکانی ئەهواز مرد. ئەو بەهۆی نەخۆشی قۆڵنجەوە مرد. پزیشکەکان داویان لێکرد بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی ناوسکی پاك بکاتەوە بەلأم ئەو مەرگی بەپەسەندتر لەم کارە زانی.

موعتەمید پەیکی بۆ لای یەعقوب ڕەوانە کرد و نامەیەکی بەنێردراوەکەدا نارد. لەنامەکەدا دڵنەوایی کردبوو و ڕەزامەندی خۆی لەو دەربڕیبوو و فەرمانڕەوایەتی فارسی بەو سپاردبوو. نێردراو کاتێك گەیشت کەیەعقوب لەسەر جێگە کەوتبوو. بۆ بینینی نێردراو دانیشت و لەبەردەم خۆی شمشێرێك و نانێکی وشك و پیازی دانا، دواتر مۆڵەتی هاتنی بەنێردراودا. پەیك نامەکی تەسلیم کرد. یەعقوب پێی وت: بەخەلیفە بڵێ من نەخۆشم، ئەگەر فریشتەی مەرگم لەئامێز گرت هەم من لەو ئاسوودەم هەم ئەو لەمن، و ئەگەر باش بوومەوە تەنیا شمشێر لەنێوان ئێمەدا دەبێت تا ئەو کاتەی تۆڵەی خۆم دەستێنمەوە. ئەگەر منت بریندار کرد و بەسەرمندا سەرکەوتیت، من بۆ لای ئەم وشکە نان و پیازە دەگەڕێمەوە. نێردراو گەڕایەوە. یەعقوب دوای ماوەیەك مرد.

حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی، یەعقوبی لەبەر خۆڕاگری بەسندان ناو دەبرد. یەعقوب دەستی بەسەر ڕوخجدا گرت و فەرمانڕەواکەی کوشت و دانیشتوانەکەی لەسەر دەستی یەعقوب باوەڕیان بەئیسلام هێنا. ئەم سەرزەمینە بەرفراوان بوو. ناوی فەرمانڕەواکەی کەبتیر بوو. ئەویان لەسەر تەختی زێڕین بۆ ئەم لاولا دەبرد و دوانزە پیاو تەختەکەی ئەویان هەڵدەگرت. ئەو لەسەر چیایەکی بەرز کۆشکێکی دروست کردبوو و بەمەککە ناوی دەبرد و خۆی بەخواوەند دەزانی. یەعقوب ئەوی کوشت. یەعقوب دەستی بەسەر خەلجییە و زابول و شوێنەکانی دیکە گرت بەلأم من ساڵی ئەم ڕووداوە نازانم تا باسی بکەم.

یەعقوب بیرمەند و دووربینەندێش بوو. ئەو دەیوت: لەگەڵ هەرکەس بۆ ماوەی

چل شەو هاموشۆت کرد و ئەخلاقی ئەوت نەناسی، لەماوەی چل ساڵیشدا نایناسیت. ئەوەی لەکردەوەکانی ئەو ئاماژەی پێدرا، بەڵگەیە بۆ فرمزانی ئەو.

کاتێك یەعقوب مرد، عەمرۆ کوڕی لەیسی برای جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست وفەرمانبەری خۆی بۆ خەلیفە نووسی. موەفەق ئەوی و کوڕی فەرمانڕەوای خوراسان، فارس، ئیسفەهان، سیستان، سند، کرمان و ئاسایشی بەغداد دەستنیشان کرد. کەسانێکی بۆ ئەم فەرمانە کردە شایەت و خەڵاتی بۆ نارد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا قاسم کوڕی موهات دژی دۆلف کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی باوکی دۆلف لەئیسفەهان ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ئەوی کوشت. بەدوای ئەمە دەستەیەك لەهاوەڵانی باوکی دۆلف دژی قاسم شۆڕشیان کرد و گیانیان گرت و ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیزیان کردە فەرماندەی خۆیان. ئەو برای عەبدولعەزیز بوو.

لەم ساڵەدا محەممەد مەولەد پەیوەستی یەعقوب کوڕی لەیس بوو، یەعقوب ڕێزی گرت و دڵنەوایی کرد. خەلیفە فەرمانیدا (بەتاوانی پەیوەست بوون بەیەعقوب) دەست بەسەر سامان و زەوییەکانیدا بگرن.

هەروەها لەم ساڵەدا بیابان نشینەکانی عەرەب لەدێمما جەعلانیان کوشت. جەعلان بەعەیارە ناوی دەرکردبوو. ئەو کاروانێکی بەرێ کرد کەعەرەبە بیابان نشینەکان هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت.. هاوەڵانی شوێن بکوژەکان کەوتن بەڵام نەیانتوانی ئەوان بگرن.

لەم ساڵەدا موەفەق، سلێمان کوڕی وەهب و کوڕەکەی عوبەیداللە و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەوی خستە زیندانەوە و سامان و زەوییەکانی ئەوانی زەوت کرد. لەناو ئەواندا تەنیا ئەحمەد کوڕی سلێمانی ڕزگار کرد. دواتر موەفەق لەگەڵ سلێمان و عوبەیداللە ڕێگەی سازانی گرتەبەر بەو مەرجەی نۆسەد هەزار دینار

بدەن و ئەو زەوییەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە و لەشوێنێك بیانپارێزێت و هەرکەس بخوازێت دەتوانێت سەردانیان بکات.

لەم ساڵەدا موسا کوڕی ئوتامش و ئیسحاق کوڕی کونداجیق و فەزڵ کوڕی موسا کوڕی بوغا (بۆ دژایەتی کردنی موەفەق) سوپایان رازاندەوە و لەپردی بەغداد گوزەریان کرد. موەفەق داوای گەڕانەوەی لێکردن بەڵام ئەوان نەگەڕانەوە و لەسەرپسەڕ ئوردوویان لێدا. باوکی ئەحمەد موەفەق نامەیەکی بۆ ساعید کوڕی مەخلەد نووسی و ئەو بۆ لای ئەم سەرکردانە بەرێکەوت و ئەوانی لەسەرپسەڕ گەڕاندەوە و موەفەق خەڵاتی بۆ ناردن.

هەروەها لەم ساڵەدا پێنج بەتریق (سوپاسالار)ی رۆمی هێرشیان کردە سەر ئەزەنە، کوشتیان و ئەسیریان کرد. لەم کاتەدا ئەرجوز، سنووردار بوو. ئەویان لەپۆستەکەی دوور کردەوە و هاوشێوەی پاسەوانی سنور لەهەمان جێگە مایەوە. رۆمییەکان چوارسەد کەسیان ئەسیر کرد و نزیکەی هەزار و چوارسەد کەسیان کوشت. ئەم پێشهاتە لەمانگی جومادی الاوەل/ دێسامبەر روویدا.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵەی خوجوستانی دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت. حسەین کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوڵڵە بەرەو مەرو ڕۆشت. ئەو بەنوێنەرایەتی براکەی محەممەد کوڕی تاهیر فەرمانڕەوایەتی ئەوی دیارەی دەکرد. توس وێران کرا.

لەم ساڵەدا باوکی سەقەر ئیسماعیل کوڕی بولبول وەزارەتی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەعەرەبە سارانشینەکان لەهۆزی مناڵەکانی ئەسەد هێرشیان کردە سەر عەلی کوڕی مەسروری بەڵخی پێش ئەوەی بگاتە موغەیسە لەرێگەی مەککە. موەفەق ئەوی بۆ پارێزگاری کردن لەو دیارە ڕەوانە کردبوو.

لەم ساڵەدا شەهریاری رۆم، عەبدوڵڵە کوڕی ڕەشید کوڕی کاوس و دەستەیەکی دیکە لەئەسیرەکان و چەند قورئانێکی (لەناو تالانییەکان دەستیان کەوتبوو) وەك دیاری بۆ ئەحمەد کوڕی تولون نارد.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیسای هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی موغەیرە عیسا کوڕی محەممەدی مەخزومی لەمەککەوە ڕۆشت و پەیوەستی ساحەبی زەنج.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی مەنسوری زەنادی لەتەمەنی هەشتا و سێ ساڵی و ئیبراهیم کوڕی هانی باوکی ئیسحاقی نەیشابوری لەهاوەڵانی ئەحمەد کوڕی حەنبەل و عەلی کوڕی حەرب کوڕی محەممەدی تائی موسڵی کە بەگومانێك لە٧٩١/١٧٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو، لەگەڵ عەلی کوڕی موەفەقی خۆپارێز، کۆچی دواییان کرد.

لەم ساڵەدا باوکی فەزڵ عەباس کوڕی فەرەجی ڕەیاشی لەبەسرە بەدەستی زەنگییەکان کوژرا. ئەو زانست لەباوکی عوبەیدە و ئەسمەعی فێر ببوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەشت و شەشی کۆچی ( ٨٨٠ زایینی )

### سەرەنەنجامی کاری زەنگییەکان و ئەغرتەمش

لەم ساڵەدا سنوری فەرمانڕەوایەتی تەکینی بوخاری لەدەوروبەری ئەهواز بەئەغرتەمش سپێردرا و ئەو لەمانگی رەمەزان/ ئاوریل پۆشتە شوشتەر. ئەبا و مەتەر کوڕی جامیع هاورێیەتیان دەکرد. مەتەر کوڕی جامیع، جەعفەرویە، کۆیلەی عەلی کوڕی ئەبان و دەستەیەکی دیکە لەئەسیرەکانی کوشت و لەوێوە بەرەو عەسکەر موکەرەم بەرێکەوتن. زەنگییەکان بەفەرماندەیی عەلی کوڕی ئەبان مەبەستی ئەوانیان کرد و لەنێوان دوو سوپا جەنگ هەڵگیرسا. کاتێك ئەغرتەمش و سوپاکەی ژمارەی زۆری سوپای زەنگییەکانیان بینی، پردەکەیان وێران و خۆیان لەجەنگ بەدوور گرت. عەلی کوڕی ئەبان بۆ ئەهواز گەڕایەوە و خەلیلی برای لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەزەنگییەکان لەمەسرەقان مانەوە.

ئەغرتەمش و هاوەڵانی ئەو مەبەستی جەنگی خەلیلیان کرد تا بەگوزەر کردن لەپردی ئەربوك خۆیان بەئوردووگاکەی بگەیێنن. خەلیل براکەی خۆی لەجموجوڵی ئەغرتەمش ئاگادار کردەوە و ئەو خۆی گەیاندە قەراغ ڕووبار. ئەم کارە بووە هۆی ترسی هاوەڵانی ئەو لەئەهواز، ئەوان بەرەو کەنارەکانی ڕووباری سەدرە بەرێکەوتن. عەلی لەهەمان ڕۆژ ڕووبەڕووی ئەغرتەمش بوویەوە و دواتر بۆ ئەهواز گەڕایەوە بەڵام ئەو سوپایەی لەئەهواز بەجێیهێشتبوو، دیار نەمابوون. کەسی بەدوای ئەواندا نارد تا لەڕووباری سەدرە بیانگەڕێنێتەوە بەڵام ئەوان ئەم کارەیان بەگران و ناپەسەند زانی. عەلیش بەناچاری پەیوەستی ئەوان بوو. ئەغرتەمش گەڕایەوە و لەعەسکەر موکەرەم ئوردووی لێدا. عەلی خۆی بۆ جەنگی ئەو ئامادە کرد.

هەواڵەکانی تایبەت بەعەلی بەئەغرتەمش و سوپاکەی خەلیفە گەیشت. ئەغرتەمش و سوپاکەی بۆ جەنگی عەلی بەرێکەوتن. عەلی بۆسەی بۆ نانەوە و خەلیلی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و هێشتا

سەرەتای جەنگەکە بوو کەئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، هاتنەدەر. سوپاکەی ئەغرتەمش هەڵات و مەتەر کوڕی جامیع و دەستەیەك لەسەرکردەکان گرفتار بوون. عەلی ئەوی لەسزای جەعفەرویەی کۆیلەی کوشت و بۆ ئەهواز گەڕایەوە و سەری کوژراوەکانی بۆ ساحەبی زەنج نارد.

دواتر عەلی کوڕی ئەبان و ئەغرتەمش لەجەنگەکاندا یەکسان بوون و شکست و سەرکەوتنیان وەك یەك بوو. ساحەبی زەنج بەشی زۆری سوپاکەی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبان نارد و کاتێك ئەغرتەمش زۆری سوپاکەی ئەوی بینی، ڕێگەی سازانی گرتەبەر و عەلی بەردەوام بەتاڵان کردنی کەنارەکانەوە سەرقاڵ بوو. یەکێك لەو شوێنانە گوندی بیروزە کەعەلی هێرشی کردەسەر و تاڵانی کرد و تاڵانییەکانی بۆ ساحەبی زەنج نارد.

## زەنگییەکان دەڕۆنە ناو رامهورموز

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئەبان و زەنگییەکان ڕۆشتنە ناو رامهورموز. چۆنیەتییەکەی بەم شێوەیە: محەممەد کوڕی عوبەیداللە بەهۆی ڕقی لەعەلی، لێی دەترسا –پێشتر باسمان کرد– بەم شێوەیە نامەی بۆ ئەنکلای کوڕی ساحەبی زەنج نووسی و داوای لێکرد داوا لەباوکی بکات دەستی عەلی کوڕی ئەبان لەژیانی ئەو دوور بخاتەوە و محەممەد پەیوەست بەخۆی بکات. ئەمە توڕەیی عەلی زیاتر کرد و داوای لەساحەبی زەنج کرد مۆڵەتی جەنگ لەگەڵ محەممەدی پێبدات و دانی باج بکاتە بیانو و بەڵگەی شەڕ. ساحەبی زەنج مۆڵەتی پێدا. عەلی نامەیەکی بۆ محەممەد نووسی و داوای باجی لێکرد بەڵام محەممەد خۆی دوادەخست. عەلی هێرشی کردە سەر رامهورموز. محەممەد هەڵات و عەلی و زەنگییەکان هێرشیان کردە سەر شارەکە و پەردەکانیان دڕاند. محەممەد لەدوورترین بەشی سنوورەکەی خۆی پەنای گرت و عەلی لەگەڵ تاڵانییەکان گەڕایەوە.

محەممەد ترسا و نامەیەکی بۆ عەلی نووسی و خوازیاری ئاشتی بوو. عەلی لەبەرابەر بڕێك پارەی داواکراو بەئاشتی رازی بوو. محەممەد دووسەد هەزار درهەمی بۆ نارد. عەلی پارەکانی بۆ ساحەبی زەنج ڕەوانە کرد و لەمحەممەد و

سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو چاوی پۆشی.

لەم ساڵەدا زەنگییەکان گرفتاری جەنگێك بوون و شکستیان خوارد. چۆنیەتیەکەی بەم شێوە بوو: محەممەد کوڕی عوبیدالله دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ عەلی ئەبان نامەیەکی بۆنووسی و بۆ سەرکوت کردنی کوردەکانی داربان داوای هاوکاری لێکرد و بەدەست کەوتنی تالآنی فراوان، دڵخۆشی کرد. عەلی کوڕی ئەبان داوای مۆڵەتی لەساحەبی زەنج کرد. ساحەبی زەنج نامەی بۆ عەلی نووسی و فەرمانی پێدا سوپایەك بۆ هاوکاری محەممەد ڕەوانە بکات بەلآم خۆی بمێنێتەوە و چەندین کەس وەك بارمتە لەمحەممەد کوڕی عوبەیدالله وەربگرێت تا دڵنیا بێتە و لەتۆڵەسەندنەوەی ئەو لەئەماندا بێت. عەلی نامەیەکی بۆ محەممەد نووسی و داوای لێکرد سوێند بخوات و چەند کەسێك وەك بارمتە ڕەوانە بکات. محەممەد سوێندی خوارد بەلآم لەناردنی بارمتەکان خۆی دوا دەخست. عەلی کوڕی ئەبان بەهۆی تەماحی دەستکەوتنی تالآنییەکان سوپاکەی ڕەوانە کرد. محەممەد ئەم سوپایەی تێکەڵ بەدەستەیەك لەسوپاکەی کرد و بۆ جەنگی کوردەکان ڕەوانەی کردن. کوردەکان هاتنە گۆڕەپان و جەنگ دەستی پێکرد. هاوەڵآنی محەممەد خۆیان لەزەنگییەکان بەدوور دەگرت و بەمشێوەیە زەنگییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان بەدەستی کوردەکان کوژران. محەممەد کوڕی عوبەیدالله دەستەیەکی ئامادە کردبوو تا ئەگەر زەنگییەکان مەبەستی هەلآتنیان کرد، ڕێگەی هەلآتنیان لێ بگرن. ئەوانیش ڕێگەی هەلآتنی زەنگییەکانیان بەست و هێرشیان کردنەسەر و دەستیان بەسەر ئەسپ وکەرەستەکانی جەنگی ئەواندا گرت و زەنگییەکان شڕ و تێکشکاو گەڕانەوە. عەلی کوڕی ئەبان ساحەبی زەنجی لەدواهاتەکانی ئەم جەنگە ئاگادار کردەوە. ساحەبی زەنج سەرکۆنەی کرد و وتی: بەوەرنەگرتنی بارمتەکان، کارەکەی منت بەفیڕۆدا. نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ محەممەد نووسی. محەممەد ترسا و نامەیەکی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و لەخۆبوردووی نیشاندا و ژمارەیەك لەئەسپەکانی گەڕاندەوە، وتی: باروودۆخم لەو کەسانەی ئەم ئەسپانەیان لەسوپاکەی تۆ سەندبوو، دژوار-کرد وئەسپەکانم وەرگرتەوە. محەممەد کەسی بۆ

لای بێهبود و محەممەد کوڕی یەحیای کرمانی (نزیکترین کەسەکان لەعەلی کوڕی ئەبان) نارد و بەڵێنی پارەی پێدان تا ئاشتی لەنێوان ئەو و عەلی کوڕی ئەبان و ساحەبی زەنج سەقامگیر بکەن. ئەو دوانە ئەو کارەیان کرد. ساحەبی زەنج بەو مەرجە رازی بوو کەمحەممەد لەسەر مینبەرەکەی خۆی بەناوی ساحەبی زەنج وتاری بخوێنێتەوە. ئەو دوانە محەممەدیان لەخواستەکەی ساحەبی زەنج ئاگادار کردەوە. محەممەد رازی بوو بەلاّم بەناو ساحەبی زەنجەوە وتاری نەدەخوێندەوە.

دواتر عەلی کوڕی ئەبان بۆ هێرش کردنە سەر قەلاّی مەتوس سوپای رازاندەوە و رووی کردە ئەو کەنارە بەلاّم سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا وگەڕایەوە و سەرقاڵی دروست کردنی پەیژە و کەرەستە جەنگییەکان بوو تا بتوانێت بەسەر دیواری شارەکەدا سەرکەوێت. بەم شێوەیە خۆی بۆ گرتنی ئەو شارە ئامادە کرد. مەسروری بەڵخی لەمەبەستی ئەو ئاگادار بوویەوە. ئەو لەم کاتەدا لەدەوروبەری ئەهواز ژیانی بەسەر دەبرد. کاتێك عەلی کوڕی ئەبان بەرەو مەتوس بەرێکەوت، مەسرور هێرشی کردە سەر عەلی و پێش ئاوا بوونی هەتاو خۆی پێگەیاند لەکاتێکدا عەلی گەیشتبووە مەتوس. کاتێك چاوی زەنگییەکان بەپێشەنگی سوپاکەی مەسرور کەوت، بەقێزەونترین شێوە هەلاّتن و ئەوەی دروستیان کردبوو، بەجێیان هێشت و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و عەلی، تێکشکاو گەڕایەوە. دوای ماوەیەك هەواڵی هاتنی موەفەقیان پێگەیشت. عەلی کوڕی ئەبان دوای گەڕانەوە لەمەتوس جەنگی نەکرد تا ئەو کاتەی موەفەق دەستی بەسەر پێنج شەممە (سوق الخميس) بازار و تەهسادا گرت. ساحەبی زەنج نامەیەکی بۆ نووسی و هانیدا بەرەو ئوردووگاکەی ئەو بڕوات.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر/ سێپتامبەر عەمرۆ کوڕی لەیس، عەبدوللە کوڕی تاهیری وەك جێگری خۆی بۆ سەقامگیر کردنی ئاسایشی بەغداد دەستنیشان کرد و موەفەق سامەرای پێ زیاد کرد و خەڵاتی بۆ جێگری عەمرۆ نارد. هەروەها خەڵاتی سەرۆکایەتی ئاسایشی بۆ عەمرۆ نارد.،

لەسەفەر/ سێپتامبەری ئەم ساڵە، ئەستاکین دەستی بەسەر شورتە (لەدەوروبەری سیستان) و ڕەی گرت خەتلەنخەجور فەرمانڕەوای ڕەی لەشارەکە دەرپەڕاند. دواتر ڕێگەی قەزوێنی گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی کەیغلەغدا بوو. کەیغەلەغ ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر و ئەستاکین ڕۆشتە ناو قەزوێن و دواتر بۆ ڕەی گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەسوپای ڕۆم هێرشیان کردە سەر پردی سەیهی لەکەنارەکانی ڕەبیعە و دووسەد و پەنجا کەسیان ئەسیر کرد و ئەندامی موسوڵمانانیان بڕییەوە. دانیشتوانی موسڵ و نەسیبین هێرشیان کردنەسەر و ڕۆمییەکان بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا باوکی ساج لەکاتی گەڕانەوە لەلەشکرگەی عەمرۆ کوڕی لەیس بۆ بەغداد، لەجوندیشاپور مرد. سلێمان کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر پێش ئەو مردبوو و عەمرۆ کوڕی لەیس، ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆڵفی لەم ساڵەدا وەك فەرمانڕەوای ئیسفەهان و محەممەد کوڕی باوکی ساجی وەك پارێزەری ڕێگەی مەککە و حەرەمین دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی کەنداج لەئەحمەد کوڕی موسا کوڕی بوغا جیابوویەوە. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك ئەحمەد ڕێگەی جەزیرەی گرتەبەر و موسا کوڕی ئوتامش فەرمانڕەوایەتی ڕەبیعەی پێبڕا، ئیسحاق کوڕی کەنداج ڕەخنەی گرت و لەسوپاکەی ئەحمەد جیابوویەوە و ڕوویکردە بەلەد و لەگەڵ کوردە یەعقوبییەکان جەنگی و شکستی پێهێنان و دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرت. دواتر ڕووبەڕووی موساوری خارجی بوویەوە و ئەوی کوشت. دواتر ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و دانیشتوانەکەی بەدانی پارە ناچار کرد و بەناچاری پارەکەیان

بۆ کۆکردەوە.

لەمەعلەسایا سەرکردەیەکی گەورە بوو بەناوی عەلی کوڕی داود. ئەو وتارخوێنی خەڵکی موسڵ و بەرگری کردنی ئەوانی لەئەستۆدا بوو. کوڕی کەنداج مەبەستی ئەوانی کرد. عەلی ئەمەی بیست و لەمەلەسایا ڕۆشت و لەدیجلە گوزەری کرد و لەگەڵ حەمدان کوڕی حەمدون بۆ لای ئیسحاق کوڕی ئەیوب کوڕی ئەحمەدی تەغلەبی عەدەوی ڕۆشت. ئەم دەستەیە کۆبوونەوە و ژمارەیان گەیشتە پانزە هەزار کەس. کوڕی کەنداج لەکۆبوونەوەی ئەوان ئاگادار بوویەوە. لەبەلەد و دیجلە پەڕییەوە و لەگەڵ سێ هەزار کەس ڕووبەڕووی عەلی بوویەوە. ئەو ڕۆشتە ڕووباری ئەیوب و دوو سوپا لەکەراسا جەنگیان ئەزمون کرد ئەمڕۆ کەراسا (ڕۆژگاری نوسەر) بەتەل موسا ناو دەبەن. هەردوو سوپا ریزیان بەست. فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی باوکی ئەیوب پەیامی بۆ کوڕی کەنداج نارد: من لەباڵی چەپی سوپاکەدام، هێرش بکەسەر من و شکستم پێ بێنە (بەمەبەستی پەیمان شکێنی لەگەڵ کوڕی ئەیوب). کوڕی کەنداج ئەو کارەی کرد و باڵی چەپی سوپاکەی ئەیووبی تێکشکاند وکەسانی دیکە هەڵاتن. حەمدان کوڕی حەمدون و عەلی کوڕی داود بەرەو نەیشابور ڕۆشتن و کوڕی ئەیوب ڕێگەی نەسیبینی گرتەبەر. کوڕی کەنداج، شوێنپێی کوڕی ئەیوبی هەڵگرت و کوڕی ئەیوب لەنەسیبینەوە ڕێگەی ئامەدی (دیاربەکر) گرتەبەر و کوڕی کەنداج دەستی بەسەر نەسیبین و سەرزەمینی ڕەبیعەدا گرت. کوڕی ئەیوب لەعیسا کوڕی شەیخی شەیانی لەئامەدا داوای پەنای کرد و عیسا پەنایدا. کوڕی ئەیوب لەباوکی موعز کوڕی موسا کوڕی زورارە لەئەرزەن داوای هاوکاری کرد و ئەویش هاوکاری کرد. کوڕی شەیخ و کوڕی زورارە و کەسانی دیکە دەیانویست دووسەد هەزار دینار بەکوڕی کەنداج بدەن تا ئەوان وەك فەرمانڕەوای سنورەکەیان دیاری بکات بەڵام ئەو ڕازی نەبوو. لەبەر ئەمە ئەوان بۆ جەنگ دژی ئەو یەکیان گرت. کوڕی کەنداج کاتێك ئەمەی بینی، بەداوای ئەوان ڕازی بوو و چاوپۆشی لێکردن و ئەوانیش بۆ سنوری خۆیان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولڕەحمان فەرمانیدا لەشاری کوردوبا

(قورتەبە) کەشتی دروست بکەن. کەشتییەکانیان دروست کرد و خستیانە ناو دەریای موحیت (ئۆقیانوس). بزوێنەری بۆ ئەو کارە ئەوە بوو پێیان وت جەلیقییە (گالیسیا) لەلای ئۆقیانوسەوە هیچ ڕێگرێکی نییە و زاڵبوون بەسەر ئەو سەرزەمینە لەو دەڤەرەوە زۆر ئاسانە. لەبەر ئەمە فەرمانی دروست کردنی کەشتییەکانی دەرکرد. کاتێك لەدروست کردنی کەشتییەکان تەواو بوو، خواردەمەنی لەکەشتییەکان بار کرد و ڕەوانەی ئوقیانوسی کردن. کاتێك مەلەوانان و توێشووەکان لەناو کەشتییەکاندا جێگەیان گرت، کەشتییەکان شکان و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان مایەوە.

لەم ساڵەدا کەشتییە جەنگییەکانی موسوڵمانان لەگەڵ کەشتییە جەنگییەکانی ڕۆم لەسیسل، جەنگان و شەڕێکی قورس لەناو ئەواندا دەستی پێکرد. ڕۆمییەکان بەسەر موسوڵمانان زاڵبوون و ئەوەی لەموسوڵمانان ڕزگاری بوو، بەرەو شاری بەلەرم لەسیسل هەڵات.

لەم ساڵەدا وشکەساڵی و قاتوقڕییەکی ئەوتۆ لەئەفریقییە دەرکەوت کەخواردن بەدژواری دەست دەکەوت.

لەم ساڵەدا دانیشتوانی حیمس کارگوزارەکەی خۆیان، عیسای کەرخیان کوشت.

لەم ساڵەدا لۆلۆ کۆیلەی ئەحمەد کوڕی تولون شەوانە لەرابییەی مناڵەکانی تەمیم هێرشی کردە سەر موسا کوڕی ئوتامش لەرەئس عەین و موسای ئەسیر کرد و ڕەوانەی ڕەققەی کرد. دواتر لۆلۆ ڕووبەڕووی ئەحمەد کوڕی موسا کوڕی ئوتامش بوویەوە و ئەم بارە شکستی پێهێنا. سوپاکەی لۆلۆ عەرەبە بیابان نشینەکان بوون. عەرەبەکان لەبەر تەماح ڕوویان کردە ئوردووگاکەی ئەحمەد بۆ ئەوەی تاڵانی بکەن. لۆلۆ بوێری زیادی کرد و هێرشی کردە ئەحمەد و شکستی پێهێنا و هەڵاتوان بۆ قرقیسیا هەڵاتن ولەوێوە ڕێگەی بەغداد و سامەرایان گرتەبەر. پێشتر وتمان وەك مێژوو نوسانی میسر دەڵێن، ئەو کەسەی موسای ئەسیر کرد کەسێك جگە لەلۆلۆ بوو.

لەم ساڵەدا لەنێوان ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز و بەکتەمەر جەنگ ڕوویدا و

بەکتەمەر شکستی خوارد و بۆ بەغداد هەڵات.

هەروەها لەم ساڵەدا خوجوستانی بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشی کردە سەر حەسەن کوڕی زەید لەجورجان. حەسەن شکستی خوارد و بۆ ئامول هەڵات و خوجوستانی دەستی بەسەر جورجان و دەوروبەری تەبەرستاندا گرت. کاتێك حەسەن (پێش ئەم جەنگە) لەتەبەرستان هێرشی کردە سەر جورجان، حەسەن کوڕی محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی عەبدوللە کوڕی حسەین ئەسغەری عەقیقی وەك جێگری خۆی لەساری دەستنیشان کرد. کاتێك خوجوستانی، شکستی بەحەسەن کوڕی زەید هێنا، عەقیقی لەساری وای نیشاندا کەحەسەن کوژراوە و پێشنیاری بەستنی بەیعەتی خۆی بەخەڵکان کرد و دەستەیەك دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد بەڵام حەسەن کوڕی زەید هات ودژی ئەو جەنگی و شکستی پێهێنا و گیانی گرت.

لەم ساڵەدا لەنێوان خوجوستانی و عەمرۆ کوڕی لەیس جەنگ روویدا و بەشکستی عەمرۆ کۆتایی هات. خوجوستانی هاتە نەیشابور و کارگوزاران و شوێنکەوتەکانی عومەری لەو شارە دوور کردەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان عەلەوییەکان و جەعفەرییەکان لەمەدینە و دەوروبەری شەڕ هاتە ئاراوە.

لەم ساڵەدا عەرەبە بیابان نشینەکان پەردەی کەعبەیان تاڵان کرد و بەشێکی ئەم پەردەیان بردە لای ساحەبی زەنج. حاجییەکان گرفتاری دژوارییەکی کوشندە بوون.

لەم ساڵەدا رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی رەبیعە و خەڵکان خۆیان ئامادە کرد بەڵام سەرما بەئەندازەیەك کوشندە بوو کەس نەیتوانی ملی رێگە بگرێتەبەر.

هەروەها لەم ساڵەدا سیما نوێنەری ئەحمەد کوڕی تولون لەسنورەکانی شام، لەگەڵ سێسەد سەرباز لەتەرسوس هێرشیان کردە سەر رۆم. نزیکەی چوار هەزار سەرباز لەهێرقەلە هاتنەدەر و لەنێوان دوو سوپا جەنگێکی ماڵوێرانکەر روویدا و موسوڵمانان خوێنی ژمارەیەکی زۆریان ڕشت و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان کوژرا.

لەم ساڵەدا لەمەدینەی پێغەمبەر(د.خ) لەنێوان عەلەوییەکان و جەعفەرییەکان شەڕ هاتە ئاراوە و گرانی دەستی پێکرد و چیتر خواردەمەنی بەئاسانی دەست نەدەکەوت. گرانی شارەکانی دیکە وەك حیجاز، عێراق، موسڵ، جەزیرە و شامی گرتەوە بەلاّم وەك گرانی شاری مەدینە نەبوو.

لەم ساڵەدا خەڵکان لەسەرزەمینەکانی ژێر فەرمانی خەلیفە بەسەختی ژیانیان بەسەر دەبرد چوونکە بەهۆی سەرقاڵ بوونی موەفەق بەجەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج و ناتەوانی موعتەمید و سەرقاڵ بوونی ئەو بەکارە ناحکومییەکان، سەرکردە و فەرماندەکان کاروبارەکانیان گرتبووە دەست و کەمتر بیریان لەئاسایش و راحەتی خەڵکان دەکردەوە و ڕێگەیان لەدەست درێژی کەس نەدەگرت.

لەتشرینی سانی/ شەوال/ مەی ئەم ساڵە گەرما و بەدوای گەرما، سەرمایەکی کوشندە دەستی پێکرد و ئاو بەستی.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی باوکی ساج هاتە مەککە و مەخزومی ڕێگەی جەنگی گرتەبەر. محەممەد شکستی پێهێنا و سامانەکەی تالاّن کرد. ئەم پێشهاتە لەرۆژی ترویە (هەشتی زیحەججە) روویدا.

لەم ساڵەدا کەیغەلەغ لەکوێستانەکان (لورستان، کوردوستان، کێوی زاگرۆس) ڕۆشت و بەکتەمەر لەدینەوەر گەڕایەوە.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیسای هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی شوجاع ئەبوبەکری سەلجی لەیارانی حەسەن کوڕی زیاد لۆلۆی هاوەڵی باوکی حەنیفە، کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی ئەحمەد کوڕی حەنبەل کە لەساڵی ٨٤٧/٢٣٣ زایینی چاوەکانی بۆ هەمیشە بەست.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و شەست و حەوتی كۆچی ( ٨٨١ زایینی )

### بەسەرهاتی زەنگییەكان

لەم ساڵەدا باوكی عەباس موەفەق دەستی بەسەر هەموو ئەوەی لەژێر دەستی سلێمان كوڕی جامیع و زەنگییەكان لەدەوروبەری دیجلە زاڵ بوو. باوكی عەباس ئەو كەسەیە دوای مەرگی موعتەمید لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت و بەنازناوی موعتەزید باللە بەناو بانگە.

هۆكاری بزوتنەوەكەی ئەوە بوو كاتێك زەنگییەكان ڕۆشتنە واست و لەگەڵ دانیشتوانەكەی – بەو شێوەی ئاماژەمان پێدا– هەڵس و كەوتیان كرد، موەفەق ئاگادار بوویەوە ولەرەبیع الاخری ٢٦٦/ نۆڤەمبەری ٨٨٠ زایینی فەرمانی بەكوڕەكەیدا بەرەو ئەو ناوچەیە ئەسپ غاربدات. خۆی ماڵئاوایی لێكرد و دەهەزار سوار و پیادە و توێشوی پێویست و كەشتی و بەلەمە جەنگییەكان و گوزەرگاكانی (ئەگەری هەیە مەبەستی پردە جوڵاوەكان بێت) لەگەڵ نارد. ئەو هات و لەدێر عاقول دابەزی.

فەرماندەی ئەو لەهێزی دەریایی نەسیر ناسراو بەباوكی حەمزە بوو. نەسیر بۆ باوكی عەباسی نووسی كەسلێمان كوڕی جامیع لەگەڵ سوارەكان و پیادەكانی خۆی لەگەڵ كەشتی و بەلەمە جەنگییەكان هاتووە و فەرماندەی ئەوان حەیاتیە (لەمێژووی تەبەری جەبایی) و لەدوورگەی نزیك بەردەرویا دابەزیوە و سلێمان كوڕی موسای شەعرانی لەگەڵ سوار و پیادەكانی خۆی بەبەلەمە جەنگییەكان گەیشتۆتە مێعرابان. (لەمێژووی تەبەری بەنەهرابان ناوی هاتووە.)

باوكی عەباس بەرێكەوت و گەیشتە سێلح و پێشەنگەكانی خۆی ڕەوانە كرد تا لەبارودۆخی دوژمن ئاگادار ببنەوە. هەواڵنێران هاتن و ئەویان لەهاتنی زەنگییەكان و سوپای دوژمن ئاگادار كردەوە. بەپێی هەواڵەكەی ئەوان سەرەتای سوپای زەنگییەكان لەسێلح و كۆتایی سوپاكەیان لەبێستانی موسا كوڕی بوغا، لەخوارەوەی واست بوو.

هۆکاری ئامادە بوونی زەنگییەکان ئەوە بوو بەخۆیان وت: باوکی عەباس گەنجێکە و بێ ئەزمون لەجەنگ. بۆچوونی راست ئەوەیە بەهەموو هێزمانەوە هێرشی بکەینەسەر و لەیەکەم رووبەروو بوونەوە شکست بەسوپاکەی بێنن، ئەگەری هەیە بترسێت و لەئێمە دوور بکەوێتەوە. لەبەر ئەمە کۆبوونەوە و هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە. کاتێك باوکی عەباس ئەمەی زانی، رێگەی ناوقەدبڕی گرتەبەر و سوپاکەی رووبەرووی یەکەم دەستەی زەنگییەکان بوونەوە. لەم کاتەدا سوپاکەی باوکی عەباس وای نیشاندا لەدوژمن هەڵدێت بۆ ئەوەی دوژمن چاوی تەماحیان تێببڕێت. دوژمن فریوی خوارد و شوێنیان کەوت. هاواریان لەسوپاکەی باوکی عەباس دەکرد: بیر لەسەرکردەیەکی دیکە بکەنەوە چوونکە سەرکردەکەتان سەرقاڵی راو کردنە. کاتێك لەباوکی عەباس نزیك کەوتنەوە، ئەو بەسوار و پیادەکانی خۆی هێرشی کرد و بەدەنگی بەرز بەنەسیری وت: تا کەی لەم سەگانە پاشەکشێ دەکەیت؟ نەسیر (کەوای نیشان دەدا لەدوژمن هەڵدێت)، گەڕایەوە. باوکی عەباس سوار بەلەمێکی جەنگی بوو و بەبەلەمەکان گەمارۆیان خستە سەر زەنگییەکان. زەنگییەکان هەلاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. سوپاکەی باوکی عەباس تا گوندی عەبدولله لەشەش فەرسەنگی گۆڕەپانی جەنگ شوێنیان کەوت. سوپاکەی باوکی عەباس پێنج کەشتی و چەندین بەلەمی جەنگی لەزەنگییەکان سەند و دەستەیەکیان ئەسیر کرد. ژمارەیەك لەزەنگییەکان داوای ئەمانیان کرد. ئەمە یەکەم سەرکەوتنی باوکی عەباس بوو.

سلێمان کوڕی جامیع بەرەو رووباری ئەمیر ڕۆشت و سلێمان کوڕی موسا خۆی بەپێنجشەممە بازار گەیاند. باوکی عەباس لەعومر، یەك فەرسەخی واست مایەوە و کەشتییەکانی چاك کردەوە و بەیانی و ئێوارێ هێرشی دەکردە سەر زەنگییەکان.

دواتر سلێمان سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و ئەوانی ئامادە کرد و لەسێ قۆڵەوە جێگری کردن. زەنگییەکان بەخۆیان وت: ئەو گەنجێکی بێ ئەزمون و خۆپەسەندە. ئەوان بۆسەیان نایەوە. هەواڵی ئەم جموجۆڵەیان بەباوکی عەباس گەیشت. زەنگییەکان دوای بۆسە نانەوە، وشیارانە روویان کردە سوپاکەی باوکی عەباس

تا ناچاریان بکەن شوێنیان بکەون و لەم کاتەدا ئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، خۆیان ئاشکرا بکەن و هێرش بکەنە سەر سوپاکەی باوکی عەباس. بەڵام باوکی عەباس ڕێگەی نەدا سوپاکەی شوێنیان بکەون. زەنگییەکان کاتێك زانیان فریوەکەیان بێ ئەنجام بوو، سلێمان بەبەلەم و کەشتییە جەنگییەکان بەمەبەستی هێرش کردنە سەر سوپاکەی باوکی عەباس بەرێکەوت. باوکی عەباس فەرمانی بەنەسیردا ئەویش بەرێکەوێت. باوکی عەباس سوار کەشتییەکەی خۆی بەناوی غەزال بوو و دەستەیەك لەگەورەکان هاوڕێیەتیان دەکرد. فەرمانی بەسوارەکانی خۆیدا لەگەڵ ئەوان بەدرێژای بەستێن بەرێکەون بەشێوەیەك ڕێگەی وشکانی نەما و گەیشتنە ئاو. کەشتییەکان ئەسپەکانیان لەئاو پەڕاندەوە و لەنێوان دوو سوپا جەنگێکیماڵوێرانکەر دەستی پێکرد. زەنگییەکان شکستیان خوارد و باوکی عەباس چواردە کەشتی وەك تالاَنی دەست کەوت. سلێمان و حەیاتی زۆری نەمابوو بکوژرێن، ئەوان هەڵاتن و خۆیان گەیاندە تەهسا و هەموو شتێکیان لەدەستدا.

باوکی عەباس بۆ ئوردووگاکەی خۆی گەڕایەوە و فەرمانیدا کەشتی و بەلەمە جەنگییە تالاَن کراوەکان چاك بکەنەوە. لەناو زەنگییەکان تا بیست ڕۆژ کەس دەرنەکەوت. ئەوان لەرێگە چاڵەکانیان هەڵکەند و سیخی ئاسنینیان لەناو چاڵەکان جێگیر کرد و بەحەسیر دایانپۆشی. جێگەکەیان بەخاك پڕ کردەوە تا ئەوانەی لەوێوە تێدەپەڕن بکەونە ناو چاڵەکە. ڕۆژێك پیاوێك لەفەرغانییەکان کەوتە ناو چاڵەکە و لێی ئاگادار بوونەوە و چیتر کەس لەو ڕێگەوە نەڕۆشت.

سلێمان داوای هاوکاری لەساحەبی زەنج کرد. ساحەبی زەنج چل بەلەمی جەنگی و کەرەستەی شەڕی بۆ هاوکاری ئەو نارد. دووبارە جەنگیان دەست پێکردەوە بەڵام نەیانتوانی لەبەرابەر باوکی عەباس خۆڕاگری بکەن. باوکی عەباس چەند بەلەمێکی بۆ جەنگی زەنگییەکان ڕەوانە کرد بەڵام زەنگییەکان تالاَنیان کرد. کاتێك باوکی عەباسیان لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە کەسەرقاڵی خواردن بوو. بێ ئەوەی چاوەڕوانی هاوەڵانی بکات، سوار بەلمێك بوو و کەسانی چوست و چالاك بەدوای ئەو بەرێکەوتن. ئەو خۆی بەزەنگییەکان گەیاند و ئەوان هەڵاتن و خۆیان

هەڵدایە ناو ئاوەکە. باوکی عەباس بەلەم وکەسەکانی ناو بەلەمەکەی رزگار کرد و دەستی بەسەر سی و یەك بەلەمی زەنگییەکان گرت. باوکی عەباس لەم جەنگەدا بەرادەیەك تیری هاویشت کەپەنجەی خوێنی لێهات. کاتێك گەڕایەوە، دیاری پێشکەش بەهاوەڵانی خۆی کرد و فەرمانیدا بەلەمە تاڵان کراوەکان لەزەنگییەکان چاکبکەنەوە.

باوکی عەباس بەباشی زانی بەرەو مازوران بڕوات تا لەوێوە بگاتە حەجاجییە و رووباری ئەمیر و لەبارودۆخی ئەو ناوچانە ئاگادار ببێتەوە. ئەو نەسیری سوار یەکەم بەلەمی جەنگی کرد و خۆی لەگەڵ محەممەد کوڕی شوعەیب لەناو یەکێك لەبەلەمەکان دانیشت. باوکی عەباس هاتە مازوران و گومانی دەکرد نەسیر لەبەردەم ئەو رێگە دەبڕێت بەڵام هیچ نیشانێکی لەو نەبینی. نەسیر لەرێگەیەکی جیاواز لەرێگەی باوکی عەباس رۆشتبوو. هاوەڵانی باوکی عەباس لەدوورەوە ڕانە مەڕێکیان بینی. لەگەڵ مەلەوانەکان لەبەلەمەکان هاتنەدەر تا مەڕەکان وەك تاڵانی بگرن. بەم شێوەیە باوکی عەباس و محەممەد کوڕی شوعەیب بێ هاوەڵ مانەوە و دەستەیەك لەزەنگییەکان لەهەر دوو لای رووبار هێرشیان کردە سەر ئەم دوانە. باوکی عەباس بەهاویشتنی تیر بەرگری لەخۆی دەکرد کەزیرەك و کەشتییەکانی دیکە لەرێگەوە هاتن. باوکی عەباس بێ زیان بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە. نەسیریش گەڕایەوە.

سلێمان کوڕی جامیع سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و لەتەهسا سەنگەری گرت. شەعرانی لەپێنجشەممە بازار لەپشت دیوارەکانەوە دانیشت. ئەوان بڕێکی زۆری خواردنیان لای خۆیان کۆکردەوە و دەستەیەکی فراوانی ئەوان لەسینیە کۆبوونەوە. باوکی عەباس دەستەیەك لەشاسوارەکانی بۆ سینیە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان لەرێگەی وشکانییەوە بڕۆن و ئەگەر رووبار هاتە بەردەمیان، لێی بپەڕنەوە. ئەویش بەبەلەم و کەشتییەکان رووبارەکەی بڕی. کاتێك زەنگییەکان سوارەکانیان بینی، ترسان و خۆیان لەناو ئاو و کەشتییەکان شاردەوە. دوای ماوەیەك باوکی عەباس و کەشتییەکان هاتن و زەنگییەکان چیتر پەناگایان دەست نەکەوت و دەستی فەرمانبەریان درێژ کرد. دەستەیەك لەوان کوژران و

دەستەیەکیان ئەسیر و دەستەیەکیان خۆیان هەڵدایە ناو ئاوەکە. هاوەڵانی عەباس دەستیان بەسەر کەشتییە لێوانلێو لەبرنجەکان گرت و زەنگییەکان هەڵاتن و ڕێگەی تەهسا و پێنجشەممە بازاریان گرتەبەر.

باوکی عەباسی کولەنگێکی (کورکێك: جۆرێك باڵندەیە) بەتیر پێکرا و لەئوردووگای زەنگییەکان کەوتە خوار. زەنگییەکان تیرەکەیان ناسییەوە وئەمە بووە هۆی زیاتر بوونی ترسی ئەوان. باوکی عەباس دوای ئەوەی دەستی بەسەر سینیەدا گرت، بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە.

باوکی عەباس ئاگادار بوویەوە سوپایەکی گەورە لەزەنگییەکان بەفەرماندەیی سابت کوڕی باوکی دۆلف و لۆلۆ، هەردووك زەنگی، بەرێکەوتوون. ئەو بۆ ڕووبەڕووی ئەوان بەرێکەوت و لەبەرەبەیاندا لەنێوان دوو سوپا جەنگ ڕوویدا. ژمارەیەکی زۆر لەسەربازە زەنگییەکان و کەسانی وەك لۆلۆ کوژران وسابت ئەسیر کرا. بەڵام باوکی عەباس نەیکوشت و ئەوی تەسلیم بەیەکێك لەسەرکردەکانی کرد. ژمارەیەکی زۆر لەژنەکانیشی ڕزگار کرد و فەرمانیدا ئەوان بۆ بنەماڵەکانیان بگەڕێننەوە. ئەوەی زەنگییەکان کۆیان کردبوویەوە، دەستی بەسەردا گرت و فەرمانی بەهاوەڵانیدا بۆ ڕۆشتن بەرەو پێنجشەممە بازار کەمێك بحەوێنەوە. فەرمانی بەنەسیردا تا هاوەڵانی بۆ ڕۆشتن ئامادە بکات. نەسیر پێی وت: ڕێگەی ڕووباری پێنجشەممە بازار تەسکە و دژوارە، تۆ بمێنەرەوە و ئێمە دەڕۆین. باکوی عەباس ڕازی نەبوو. محەممەد کوڕی شوعەیب پێی وت: ئەگەر بەناچاری دەبێت بێیت کەواتە ژمارەیەکی زۆر لەکەشتییەکان لەگەڵ خۆت بێنە و لەژمارەی پیاوەکان کەم بکەرەوە چوونکە ڕووبارەکە تەسکە.

باوکی عەباس بەرێکەوت. نەسیر لەپێش ئەو بوو تا گەیشتنە لێواری ڕووباری موساور. باوکی عەباس وەستا و نەسیر لەگەڵ پانزە کەشتی ڕۆشتە ڕووباری بەراتیق. ئەم ڕووبارە دەگەیشتە شەعرانی لەبازاری پێنجشەممە بازار کەپێیان دەوت مەنیفە. کاتێك نەسر لەبەرچاوی باوکی عەباس دیارنەما، دەستەیەکی فراوان لەوشکانی هێرشیان کردە سەر باوکی عەباس و ڕێگەیان نەدا بڕواتە ناو ڕووبارەکە و لەبەرەبەیانەوە تا نیمەڕۆ شەڕیان لەگەڵ کرد. ئەو لەنەسیر بێ ئاگا

بوو. زەنگییەکان دەنگیان بەرز کردەوە: نەسیرمان کوشت. باوکی عەباس خەمبار ببوو. فەرمانی بەمحەممەد کوڕی شوعەیبدا هەواڵی نەسیری بۆ بێنێت. محەممەد هات و بینی نەسیر ڕۆشتە ناو ئوردووگای زەنگییەکان و ئاگری تێ بەرداوە و سەرقاڵی جەنگە. محەممەد هاتە لای باوکی عەباس و ئاگاداری کردەوە. باوکی عەباس شادمان بوو.

نەسیر ژمارەیەك لەزەنگییەکانی گرفتار کرد و خۆی گەیاندە باوکی عەباس و ئەوی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. باوکی عەباس تا ئەو کاتەی زەنگییەکان دوور کەوتنەوە، درێژەی بەجەنگدا. ئەو دەستەیەك لەکەشتییەکانی شاردەوە و فەرمانیدا تەنیا یەك ژمارەیان ئاشکرا بکرێت. زەنگییەکان چاوی تەماحیان تێبڕی و شوێنی کەوتن و خۆیان پێگەیاند. شەڕیان لەگەڵ مەلەوانەکان دەست پێکرد کە لەناکاو کەشتییەکانی دیکە دەرکەوتن. باوکی عەباس خۆی لەناو ئەم کەشتیانەدا بوو. بەم شێوەیە زەنگییەکان پرژ و بلاو بوونەوە و باوکی عەباس دەستی بەسەر شەش بەلەمی جەنگی گرت. زەنگییەکان ترساو هەڵدەهاتن و باوکی عەباس بێ زیان بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە و ڕێزی لەمەلەوانەکان گرت و پاداشتی پێ بەخشین.

## گەیشتنی موەفەق بۆ جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان و گرتنی مەنیعە

لەسەفەر/ سێپتامبەری ئەم ساڵەی، موەفەق لەبەغداد بەرەو واست بەرێکەوت و لەگەڵ زەنگییەکان جەنگی ئەزمون کرد. چۆنیەتی دوورکەوتنی ئەو لەکوڕەکەی باوکی عەباس بەدرێژای ئەم کاتە بەم شێوە بوو کەسەرقاڵی کۆکردنەوەی سوار و پیادە جەنگاوەرەکان و توێشو و خواردەمەنی بوو تا لەجەنگ لەگەڵ زەنگییەکان سەرکەوتن بەدەست بێنێت و هەموو دەرگاکان بەڕووی ئەواندا دابخات و چیتر مەترسی ئەوان نەهێڵێت. بەلام ساحەبی زەنج، پەیکی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبانی موهەلبی نارد و فەرمانی پێدا بۆ جەنگ دژی باوکی عەباس پەیوەستی سلێمان کوڕی جامع بێت. موەفەق لەوە ترسا نەکا کوڕەکەی نەتوانێت خۆڕاگری بکات و لەبەر ئەمە لەمانگی سەفەر/ لەبەغدادەوە بەرێکەوت و لەرەبیع الاوەل/ ئۆکتۆبەر

خۆی گەیاندە واست. کوڕەکەی سەردانی کرد و لەبارودۆخی سوپا و سەرکردەکان ئاگاداری کردەوە. ئەو خەڵاتی بەباوکی عەباس بەخشی و باوکی عەباس بۆ ئوردووگاکەی خۆی لەعومر گەڕایەوە و موەفەق لەکەنار رووباری شەداد لەبەرابەر گوندی عەبدوللە ئوردووی لێدا و فەرمانی بەکوڕەکەیدا لەرۆژهەڵاتی رووباری دیجلە لەبەردوا ئوردوو لێ بدات. ئەوی وەك پێشەنگی خۆی دیاریکرد و رۆژانەی سوپاکەیدا. موەفەق فەرمانی بەمناڵەکەیدا لەگەڵ کەرەستەی جەنگ بەئەندازەی پێویست بەرەو رووباری موساور بڕوات. باوکی عەباس لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵە هەڵبژێردراوەکانی ڕۆشت و موەفەق دوای ئەو بەرێکەوت و دوو رۆژ لەو شوێنە مایەوە.

دواتر موەفەق لەرۆژی سێشەممە هەشتی رەبیع الاوەل/ هەژدەی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە لەرێگەی پێنجشەممە بازارەوە مەبەستی شاری ڕەی کرد کەساحەبی زەنج بەمەنیعە ناوی دەبرد. کەشتییەکانی بردە رووباری موساور و سوپاکەی لەبەشی رۆژهەڵاتی ئەم رووبارە بەرەو پێش برد تا ئەوەی لەبەراتقەوە ئەوانی گەیاندە مەنیعە. لەم کاتەدا موەفەق فەرمانیدا ئەسپەکان بپەڕێننەوە و لەهەردوو لای رووباری بەراتق دایان بنێن. فەرمانی بەباوکی عەباسدا پێشڕەوی بەسوپا و کەشتییەکان بکات. باوکی عەباس ئەو کارەی کرد. زەنگییەکان ئەویان بینی و بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو پەلەیان کرد و جەنگان. لەم کاتەدا باوکی ئەحمەد موەفەق و سوپاکەی لەهەردوو لای رووبارەکەوە هێرشیان کرد. زەنگییەکان کاتێك ئەمەیان بینی هەڵاتن و بڵاوەیان لێکرد. سوپاکەی باوکی عەباس بەدیوارەکەدا سەرکەوتن و هەرکەسیان بینی، کوشتیان و ڕۆشتنە ناو شارەکە و خوێنی زۆر کەسیان ڕشت و ژمارەیەکی فراوانیان ئەسیر کرد و سامانەکانیان تالأن کرد. شەعرانی و هاوەڵانی هەڵاتن و سوپاکەی موەفەق تا بەتائیح شوێنیان کەوتن. ژمارەیەکی زۆریان لەئاودا خنکان و ئەوانیتر پەنایان بۆ دارستانەکان برد.

باوکی ئەحمەد هەمان رۆژ بۆ لەشکرگەکەی خۆی گەڕایەوە. ئەو لەم جەنگەدا جگە لەژنە زەنگییەکان نزیکەی پێنج هەزار ژنی موسوڵمانی دیکەی ئازاد کرد. فەرمانیدا ژنەکان بپارێزن و بیانبەن بۆ واست و بیانگەڕێننەوە بۆ بنەماڵەکانیان.

ئەو بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ڕۆشتە ناو شارەکە و دەستی بەسەر هەموو شتێکدا گرت. سامانەکانی ئەو شارەیان کۆکردەوە. دواتر فەرمانی وێران کردنی شارەکەی دەرکرد و خەندەکەکەی بەخۆڵ داپۆشی و کەشتییەکانی سوتاند. بەرادەیەکی بێ ژمار خواردەمەنی وەك برنج و جۆی هەڵگرت و فەرمانیدا بیانفرۆشن و بۆ سوپاکەی پاشەکەوت بکەن.

سلێمان دوای هەڵاتن بەناچاری خۆی گەیاندە مەزار و لەنامەیەکدا ساحەبی زەنج لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. لەکاتی گەیشتنی نامەکە ساحەبی زەنج سەرقاڵی قسە کردن بوو. کاتێك نامەکەی خوێندەوە، گرفتاری سکچوون بوو و بەردەوام خۆی دەگەیاندە سەر ئاو. دواتر نامەیەکی بۆ سلێمان کوڕی جامیع نووسی و لەو بەڵای بەسەر شەعرانی هاتبوو، بێ بەری کرد و پێشنیاری وشیاری پێکرد.

موەفەق دوو ڕۆژ لەکەنار ڕووباری موساور مایەوە تا لەبارودۆخی شەعرانی و سلێمان ئاگادار ببێتەوە. کەسێك ئاگاداری کردەوە کەسلێمان کوڕی جامیع لەجەوانیتە. موەفەق سوپای بردە پێش و خۆی گەیاندە سینیە. فەرمانی بەباوکی عەباسی کوڕیدا بەشێوەیەکی نهێنی لەگەڵ کەشتی و بەلەمە جەنگییەکان بەرێکەوێت. باوکی عەباس خۆی گەیاندە جەوانیت بەڵام سلێمانی لەوێ نەبینی. لەوێ زەنگییەکانی لەگەڵ دوو سەرکردە بینی کەسلێمان کوڕی جامیع بۆ پاراستنی خواردەمەنییەکان لەوێ دایناببوون. باوکی عەباس لەگەڵیان جەنگی و جەنگەکە درێژەی کێشا و تاریکی شەو ئەوانی لەیەك جیا کردەوە. پیاوێك لەزەنگییەکان داوای ئەمانی لەباوکی عەباس کرد. باکوی عەباس سەبارەت بەسلێمان کوڕی جامیع پرسیاری لێکرد. ئەو بەباوکی عەباسی وت کەسلێمان لەتەهسا نیشتەجێیە و لەشوێنێك ژیان بەسەردەبات بەناوی مەنسورە. باوکی عەباس، باوکی ئاگادار کردەوە. موەفەق فەرمانی پێدا بەدوای ئەودا بێت. موەفەق خۆی گەیاندە بردوا و لەوێ مایەوە تا بارودۆخی خۆی سامان بدات و نیازەکانی خۆی و سوپاکەی دابین بکات. لەو شوێنە کەرەستە بۆ بەستنی ڕووبار و تەخت کردنی جادەی ئامادە کرد و ڤوراجی تورکی وەك کارگوزاری بوردوا دەستنیشان

کرد.

## زاڵبوونی موەفەق لەتەهسا

کاتێك موەفەق نیازەکانی خۆی بەراوەردە کرد لەبیستی رەبیع الاخری٢٦٧/ بیست و نۆی نۆڤەمبەری ٨٨١ زایینی لەبوردوا بەرەو تەهسان بەرێکەوت. ئەو لەگەڵ سوارەکانی خۆی سوار لەسەر ئەسپ رێگەی بڕی. کەشتییەکانیش بەرێکەوتبوون تا ئەوەی لەگوندی جوزیە ئوردووی لێدان و پردی هەڵبەست. سەرەتا سوارەکانی پەڕاندەوە و دواتر خۆی بەدوای ئەواندا گوزەری کرد. ڕۆشت و لەدوو میلی تەهسا ئوردووی لێدا و دوو رۆژ لەوێ مایەوە.

لەم کاتەدا بارانێکی سەخت دەستی بەبارین کرد و بووە لەمپەری دەستپێکردنی جەنگ. دواتر موەفەق سوار ئەسپەکەی خۆی بوو تا شوێنێك بۆ جەنگ بدۆزێتەوە. لەدیواری ئەو شوێنە نزیك کەوتەوە کەسلێمان بەمەنسورە ناوی دەبرد. لەناکاو ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان هێرشیان کردەسەر و ژمارەیەکیش کەخۆیان شاردبوویەوە، لەحەشارگەکانیان هاتنەدەر و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. دەستەیەك لەسوارەکانی موەفەق پیادە جەنگان تا ئەوەی توانیان خۆیان لەم گێژاوە رزگار بکەن. ژمارەیەك لەکۆیلەکانی موەفەق ئەسیر کران. باوکی عەباس کوڕی موەفەق، تیرێکی لەئەحمەد کوڕی هیندی حەیامی دا و لەمێشکی چەقی. ئەو کەوتە سەرزەوی و جەنازەکەیان بردە لای ساحەبی زەنج. ساحەبی زەنج نوێژی لەسەر خوێند. مەرگی ئەو بۆ ساحەبی زەنج دژوار بوو چوونکە یەکێك لەگەورەترین هاوەڵانی ئەو هەژمار دەکرا و بەبوونی ئەو پێویستی بەکەسانی دیکە نەدەما.

موەفەق لەکاتی ئاوابوونی هەتاو بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە و فەرمانی بەسوپاکەیدا بەردەوام پاسەوانی بدەن و بۆ جەنگ ئامادە بن. رۆژی دواتر، بیست و حەوتی رەبیع الاخر/ حەوتی دێسامبەر لەبەرەبەیاندا موەفەق سوپاکەی کۆکردەوە و بۆ چەندین دەستە دابەش کرد. دەستەیەکی سوار ئەسپ کرد و دەستەیەکی پیادە. فەرمانی بەکەشتی و بەلەمە جەنگییەکاندا بەرەو رووبارێك

پێشڕەوی بکەن کە لەشوێنی مانەوەی سلێمان نزیك دەبوونەوە. ئەم رووبارە بەمونزەر ناسرا بوو. سوپاکەی لەو شوێنانەدا جێگیر کرد کەترسی هێرش کردنی دوژمنی لەسەر بوو. دواتر لەئەسپەکەی دابەزی و چوار رەکعەت نوێژی خوێند و داوای هاوکاری لەخوارەند کرد. دواتر شمشێری بەست و فەرمانی بەباوکی عەباسی کوڕیدا بەرەو دیوارەکە پێشڕەوی بکات. باوکی عەباس پێشڕەوی کرد. بینی لەدەوری دیوارەکە خەندەکیان هەڵکەندووە و رێگەی نەدا سوپاکەی پێشڕەوی بکات. دواتر سەرکردەکان سەربازەکانیان هاندا و خۆیان لەئەسپەکان دابەزین و خەندەکەکەیان گرت و گوزەریان کرد. زەنگییەکان کاتێك چالاکی ئەوانیان بینی، هەڵاتن. هاوەڵانی عەباس شوێنیان کەوتن و ڕۆشتنە ناو شوێنی مانەوەی سلێمان. زەنگییەکان بەدروست کردنی پێنج خەندەك ئەو شوێنەیان دەپاراست و لەبەرابەر هەر خەندەکێك دیوارێکیان دروست کردبوو. ئەوان لەبەرابەر هەر دیوار و خەندەکێك خۆڕاگرییان دەکرد بەڵام هاوەڵانی باوکی عەباس لەناویان بردن. کەشتی و بەلەمە جەنگییەکانی موەفەق گەیشتن و هەموو بەلەم و کەشتییەکانیان لەناو برد. ئەوان هەر کەسێکیان لەم و لای رووبار دەبینی، دەیانکوشت یا ئەسیریان دەکرد بەشێوەیەك هەموان ئەو ناوچەیان چۆڵ کرد. پانتایی ئاوەدانی ئەو ناوچەیە یەك فەرسەنگ بوو.

موەفەق بارودۆخی گرتەدەست و سلێمان کوڕی جامیع و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەو هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژرا یا ئەسیر کرا. باوکی ئەحمەد لەژن و منداڵەکانی خەڵکی واست، کوفە و گوندەکانی دەورووبەر نزیکەی بیست هەزار کەسی رزگار کرد و فەرمانیدا ئەوان بۆ واست ببەن و تەسلیم بەبنەماڵەکانیان بکەنەوە. ئەو هەموو سامان و پاشەکەوتەکانی ئەو ناوچەی هەڵگرت و فەرمانیدا بۆ هەزینەی سوپاکە پاشەکەوتی بکەن. ژمارەیەك لەژن و منداڵەکانی سلێمانی ئەسیر کرد و هەموو هاوەڵە ئەسیرەکانی موەفەق رزگاریان بوو. دەستەیەك لەزەنگییەکان پەنایان بۆ دارستانەکان برد. فەرمانیدا شوێنیان بکەون. حەفدە رۆژ لەوێ مایەوە و دیواری شارەکەی رووخاند و خەندەکەکانی پڕکردەوە. هەر کەسێك زەنگییەکی دەهێنا، خەڵات دەکرا و هەر کاتێك زەنگییەکیان دەبردە لای، لێی

خۆش دەبوو و تەسلیم بەیەکێك لەسەرکردەکان یا کۆیلەکانی دەکرد تا بەمشێوەیە دڵنەواییان بکات.

سوپایەکی بەدوای سلێمان کوڕی جامیع ڕەوانە کرد و ئەوان تا دیجلەی عەورا ڕۆشتنە پێش بەلاّم نەیانتوانی بیگرن. باوکی ئەحمەد فەرمانی بەزیرەکدا لەتەهسا بمێنێتەوە تا دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بگەڕێنەوە و ئاسوودە بن.

## ڕۆشتنی موەفەق بۆ ئەهواز و ڕۆشتنەدەرەوەی زەنگییەکان لەو شارە

کاتێك باوکی ئەحمەد موەفەق دەستی بەسەر مەنسورەدا گرت، رووی کردە ئەهواز تا بارودۆخی ئەو سەرزەمینە سەقامگیر بکات و زەنگییەکان لەو شارە دەرپەڕێنێت. ئەو فەرمانی بەباوکی عەباسدا پێش ئەو بەرێکەوێت و رێگە بۆ سوپاکەی خۆش بکات. هارونی کوڕی وەك فەرماندەی پادگانەکە دیاریکرد. لەم کاتەدا زیرەك هاتە لای موەفەق و ئەوی لەگەڕانەوەی دانیشتوانی تەهسا ئاگادار کردەوە. زەیرەك ئەمانی پێ بەخشیبوون. موەفەق فەرمانیدا هێزەکان بەفەرماندەیی نەسیر سوار کەشتی و بەلەمەکان بن و شوێن هەلاّتووە زەنگییەکان بکەون و رووبەروویان ببنەوە و لەپێشڕەوی کردن بەردەوام بن تا دەگەنە شاری ساحەبی زەنج لەرووباری باوکی خەسیب. زیرەك بەرێکەوت.

موەفەق لەسەرەتای جومادی الاخر/ حەوتی ژانویە لەواست بەرەو شوش بەرێکەوت و مەسروری فەرمانڕەوای ئەو شارەی بۆ لای خۆی بانگ کرد.

ساحەبی زەنج کە لەچۆنیەتی هەڵس و کەوتی موەفەق لەگەڵ سلێمان و زەنگییەکان ئاگادار بوو ترسا موەفەق بیر لەهێرش کردنە سەر خۆی بکاتەوە چوونکە شوێنکەوتەکانی لەدەوروبەری ئەو بلاّو ببونەوە. نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبان نووسی و داوای لێکرد پەیوەستی ببێت. عەلی کوڕی ئەبان لەگەڵ سی هەزار سەرباز لەئەهواز بوو، خورادەمەنی و چوارپێ و شتەکانی دیکەی بەجێهێشت و محەممەد کوڕی یەحیای کەرنبائی وەك جێگری خۆی دانان و بۆ لای ساحەبی زەنج بەرێکەوت بەلاّم محەممەدیش نەیتوانی بمێنێتەوە و بەناچاری دوای عەلی بەرێکەوت. بەم شێوەیە شارەکە کەوتە دەستی موەفەق و هێزەکانی زیادیان کرد.

ساحەبی زەنج بێهبود کوڕی عەبدوەهابی بانگ کرد. ئەو کاروباری فیدەم، یاسیان و دەوروبەرکانی بەڕێوەدەبرد. بێهبود ئەوەی پاشەکەوتی کردبوو، بەجێیهێیشت و بۆ پەیوەست بوون بەساحەبی زەنج بەرێکەوت. موەفەق دەستی بەسەر سامانی ئەویشدا گرت و بەم شێوەیە بۆ جەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج، هێزێکی فراوانتری کەوتە بەردەست.

کاتێك عەلی کوڕی ئەبان ئەهوازی بەجێهێشت، نزیکەی هەزار کەس لەهاوەڵانی لەو شارە بەجێهێشت. ئەم دەستەیە کەسیان بۆ لای موەفەق نارد و داوای ئەمانیان کرد. موەفەق ئەمانی پێ بەخشین. ئەوان هاتنە لای موەفەق و ئەو، ڕۆژانەی بۆ دیاریکردن. دواتر لەشوشەوە بەرەو شوشتەر و جوندیشاپور بەرێکەوت و باجی کۆکردەوە. موەفەق پەیکی بۆ لای محەممەد کوڕی عوبەیداللەی کوردی نارد و ئەمانی پێ بەخشی و لەهەموو تاوانەکانی چاوی پۆشی. موەفەق داوای سامان و سوپای لێکرد. کوردی هاتە لای موەفەق و ئەو، ڕێزی لێگرت.

دواتر ڕێگەی عەسکەر موکەرەمی گرتەبەر و خۆی گەیاندە ئەهواز و لەوێوە بەرەو ڕووباری موبارەك لەفوراتی بەسرە ڕۆشت. نامەی بۆ هارونی کوڕی نووسی تا لەگەڵ هەموو سوپاکەی ژێر دەستی بەرەو ڕووباری موبارەك بەرێکەوێت. ئەو لەنیوەی رەجەب/ بیستی فەوریە، سوپاکەی لەوێ بینی.

کاتێك موەفەق فەرمانی بەزیرەك و نەسیردا شوێنپێی زەنگییەکان هەڵبگرن، هەدووکیان خۆیان گەیاندە ئوبولە. پیاوێك لەزەنگییەکان داوای ئەمانی کرد و ئەوانی ئاگادار کردەوە کەساحەبی زەنج ژمارەیەکی زۆر کەشتی و بەلەمی جەنگی بەمەبەستی هێرش کردنە سەر ئەوان بۆ ڕووباری دیجلە ناردووە . بەپێی وتەکانی ئەم پیاوە زەنگییەکان دەیانویست خۆیان بەئوردووگای نەسیر لەڕووباری مەرئەت بگەیێنن. نەسیر کاتێك هەواڵەکەی پێگەیشت، لەئوبولەوە بەرو ئوردووگاکەی گەڕایەوە و زیرەك لەرێگەیەکی دیکەوە ڕۆشت. ئەمە ئەو ڕێگە بوو زیرەك گومانی دەکرد زەنگییەکان لەوێوە هێرش دەکەنە سەر ئوردووگاکەی نەسیر. زیرەك لەرێگە ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و زەنگییەکان هەڵاتن. ئەوان بۆسەیان نابوویەوە بەڵام زیرەك پێشتر لەبوونی بۆسەکان ئاگادار کرابوویەوە. تا

ئەو جێگە پێشڕەوی کرد کەئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، خۆیان ئاشکرا کرد. زیرەك ژمارەیەك لەوانی کوشت و ژمارەیەکی ئەسیر کرد.

لەو کەسانەی بەدەستی زیرەك گرفتار بوون، یەکیان عیسا کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیمی بەسری یەکێك لەگەورەترین فەرماندەکانی سوپای زەنگییەکان بوو. زیرەك زیاتر لەسی بەلەمی جەنگی وەك تالآنی دەست کەوت. زەنگییەکان ترسان و ئۆقرەیان لێ بڕا و نزیکەی دوو هەزار کەس لەوان داوای ئەمانیان کرد. ئەو نامەی بۆ موەفەق نووسی. موەفەق فەرمانی پێدا ئەمانیان پێ ببەخشێت و خۆی بەمەبەستی پەیوەست بوون بەو، رێگەی رووباری موبارەك بگرێتەبەر.

موەفەق فەرمانی بەباوکی عەباسدا بۆ شەڕ لەگەڵ ساحەبی زەنج رێگەی رووباری باوکی خەسیب بگرێتەبەر. باوکی عەباس ڕۆشت و لەبەرەبەیانەوە تا نیمەڕۆ جەنگی. یەکێك لەسەرکردەکانی زەنگی و دەستەیەك بەدوای ئەو داوای ئەمانیان کرد. ئەمە پشتی ساحەبی زەنجی شکاند و باوکی عەباس سەرکەوتوو گەڕایەوە. موەفەق نامەیەکی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و داوای لێکرد لەهەموو ئەو خوێنانەی ڕشتوویەتی، پەردەی ئەو ناموسانەی دڕیویەتی، ئەو شارانەی وێرانی کردووە، ئەو سامانانەی تالآنی کردووە و ئەوەی خۆی وەك پێغەمبەر ناساندووە، پەشیمانی دەرببڕێت و بگەڕێتەوە بۆ بارەگای یەزدان و بەئەمان رازی ببێت. ساحەبی زەنج نامەکەی خوێندەوە بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە.

## گەمارۆدانی شاری ساحەبی زەنج

کاتێك موەفەق نامەی بۆ ساحەبی زەنج نووسی و وەڵامی دەستنەکەوت، بەناو سوپاکەیدا گەڕا و کەرەستەکانی جەنگی ئامادە و سەرکردەکانی بەسەر سوپاکەیدا دابەش کرد و لەبیستی رەجەب/ بیست و حەوتی مارس، لەگەڵ کوڕەکەی رێگەی شاری ساحەبی زەنجی گرتەبەر کە بەموختارە ناوی دەبرد. کاتێك گەیشت رووبەرووی دیوار و خەندك و رێگەی ناڕێك و دژوار بوویەوە. بەردهاوێژ و عارەبانەکان و کەوانەکان (کەوانی گەورە کەباقاچ زێ کەی رادەکێشرا) و کەرەستەی گەورەی جەنگ کە بۆ هیچ ئەمیر وسەرکردەیەك

کۆنەکرابوویەوە، بۆ ساحەبی زەنج و لەسەر دیوار و بورجەکان دەبینرا.

کاتێك زەنگییەکان چاویان بەسوپاکەی موەفەق کەوت، بەشێوەیەك دەنگیان بەرز کردەوە زەوی لەرزی. موەفەق فەرمانی بەکوڕەکەیدا بەرەو دیواری شارەکە پێشڕەوی بکات و کەسانی سەر دیوارەکە بەتیر بکوژن. باوکی عەباس تا ئەو جێگەی کەشتییەکانی بەر بەنداوی کۆشکەکەی ساحەبی زەنج کەوت، پێشڕەوی کرد. زەنگییەکان هێرشیان کردە سەر باوکی عەباس و شوێنکەوتەکانی. بارانی تیر و بەرد بۆ سەر سوپاکەی باوکی عەباس دەستپێکرد. بێ ئەزمونەکان لەجەنگ بەدەست بەردیان دەهاویشت.

باوکی عەباس خۆڕاگری کرد. ساحەبی زەنج و سوپاکەی خۆڕاگرییەکی ئەوتۆیان لەسوپاکەی باوکی عەباس بینی کەپێشتر لەهیچ سوپایەکیان نەبینیبوو. لەم کاتەدا موەفەق فەرمانی پاشەکشێی دەرکرد و سوپاکە گەڕایەوە. ژمارەیەك لەشەڕکەرانی دوو بەلەمی جەنگی داوای ئەمانیان کرد و موەفەق ئەمانی پێبەخشین. موەفەق بەم شەڕکەر و مەلەوانانە لەسەر بنەمای پێگەکەیان، خەلاتی بەخشی و ئەم کارەی لەشوێنێکدا ئەنجامدا هاوەلانی ئەوانیش بیبینن. ئەمە یەکێك لەکاریگەرترین فریوەکان بوو. کەسانی دیکە کاتێك ئەمەیان بینی، خوازیاری وەرگرتنی ئەمان بوون و بۆ وەرگرتنی ئەمان، پێش یەك دەکەوتن. لەو رۆژەدا ژمارەیەکی زۆر لەهێزی دەریایی زەنگییەکان پەیوەستی سوپاکەی موەفەق بوون و موەفەق خەلاتی بەهەموویان بەخشی.

کاتێك ساحەبی زەنج ئەم بارودۆخەی بینی، فەرمانیدا بەلەم ئاژۆکان بەرەو رووباری باوکی خەسیب بەرێکەون و پاسەوانەکانی لەو ناوچەیە دیاریکرد تا کەس لێی نەڕواتەدەر. فەرمانی بەبێهبوددا (یەکێك لەخراپترین سەرکردەکانی) بەکەشتییە جەنگییەکان هێرش بکاتە سەر باوکی عەباس. باوکی عەباس لەگەڵ کەشتییەکانی رووبەرووی بوویەوە و جەنگ دەستی پێکرد. بێهبود تا نزیك کۆشکەکەی ساحەبی زەنج پاشەکشێی کرد. خۆی بریندار بوو و چەند تیرێکی بەرکەوت و جەستەی بەهۆی بەرکەوتنی چەند بەردێکەوە بەتەواوی لاواز بوو. لەسەرەمەرگدا ئەویان بۆ رووباری خەسیب برد. سەرکردەی بوێری هاورێی ئەو کە

بەعومەیرە ناودەبرا، کوژرا. باوکی عەباس دەستی بەسەر کەشتییەکدا گرت و هەموو کەسەکانی ناو کەشتییەکەی کوشت و لەگەڵ هاوەڵانی بێ هیچ زیانێك گەڕایەوە. کەشتییەك بەهەموو سەرنشینەکانی ملکەچی فەرمانەکانیان بوون. باوکی عەباس ئەمانی پێبەخشین و چاکەی لەگەڵ کردن و بەبەخشینی خەڵات، قەرەبوی کردنەوە.

موەفەق لەگەڵ هاوەڵانی بۆ ئوردووگای خۆیان لەرووباری موبارەك گەڕانەوە. لەکاتی گەڕانەوە ژمارەیەکی زۆر لەزەنگییەکان داوای ئەمانیان کرد. ئەو ئەمانی پێ بەخشین و خەڵاتی کردن. ناوی ئەوانی لەپێرستی پەیوەست بووان بەباوکی عەباس نووسی. ئەو دوو رۆژ لەئوردووگاکەی مایەوە و لەبیست و چوار رەجەب/ بیست و نۆی فەوریە، رۆشتە رووباری جەتی و لەوێ ئوردووی لێدا و تا نیوەی شەعبان/ بیست و دووەمی مارس، بێ هیچ جەنگێك لەوێ مایەوە.

موەفەق لەنیوەی شەعبان/ بیست و دووی مارس ئەسپ و سوپای هەڵگرت و کەشتی و بەلەمە جەنگییەکانی ئامادە کرد. ژمارەی سەربازەکان و خۆبەخشەکانی هاورێی ئەو نزیکەی پەنجا هەزار کەس و ژمارەی هاوەڵانی ساحەبی زەنج، سێسەد هەزار کەس بوو. سوپاکەی ساحەبی زەنج یا شمشێر وەشێن بوون یا تیرهاوێژ یا رم بەدەست یا بەئەزمون لەهەڵدانی بەرد و شارەزای کەشکەنجیر. ناتەوانەکانیان سەیری جەنگیان دەکرد و بەردیان دەهاویشت و ژنەکانیش هاوکاریان دەکردن. لەم رۆژەدا باوکی ئەحمەد ئەمانی بەهەموو زەنگییەکان بەخشی جگە لەساحەبی زەنج. ئەمان نامەی لەناو کاغەزێکدا نووسی و بەتیر هاویشتی بۆ ناو زەنگییەکان. لەناو ئەمان نامەکەدا بەڵێنی چاکەی پێدابوون. ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی ساحەبی زەنج خوازیاری پەیوەست بوون بەو بوون. لەم رۆژەدا ژمارەیەکی زۆریان داوای ئەمانیا کرد. موەفەق پاداشی بەهەموویان بەخشی و لەم رۆژەدا چیتر جەنگ روونەدا.

موەفەق لەرۆژی دواتر لەرووباری جەتی کوزەری کرد و لەنزیك شاری ساحەبی زەنج ئوردووگای لێدا و سوپا و سەرکردەکانی ریزبەندی کرد. بۆ هەردەستەیەك شوێنێکی دیاریکرد تا پارێزگاری لێ بکەن. ئەو بۆ هەموو شوێنەکانی ژێر

دەسەڵاتی خۆی نامەی نووسی و فەرمانی پێدان تا ئەو جێگەی دەتوانن بەلەم و کەشتی جەنگی دروست بکەن و بەهۆیانەوە چاودێری رووبارەکانی ژێر فەرمانی خۆیان بکەن و رێگر بن لەگەیشتنی خواردەمەنی بەساحەبی زەنج. موەفەق لەشوێنەکەی خۆی ئوردووگاکەیەکی دروست کرد و بەموەفەقییە ناوی برد. فەرمانی بەکارگوزارەکانی لەوشکی و دەریادا سامان و خواردەمەنییەکان بۆ ئەو ناوچەیە رەوانە بکەن و هەر دەبیرێك کەتوانای نوسینی هەیە، رەوانەی بکەن. ئەو بۆ گەیشتنی ئەم داواکاریانە یەك مانگ چاوەڕوان بوو. خواردەمەنی بەردەوام بەدەستی دەگەیشت و بازرگانەکان کالا جۆراوجۆرەکانیان بۆ گەیاندن بەموەفەقییە ئاڵ و گۆڕ دەکرد. لەو شارە بازارەکان دروست کرا و کەشتییەکان لەلەنگەرگەکەی لەنگەریان گرت. موەفەق مزگەوتێکی گەورەی لەو شارە بنیاتنا و فەرمانی بەخەڵکاندا لەو مزگەوتە نوێژ بخوێنن. هەموو کەرەستەکانی ئاسوودەی لەم شارە ئامادە کرا و ئەو کالانەی تیا دەست دەکەوت کە لەهیچ کام لەشارە کۆنەکان نەدەبینرا. پارەکان لەم شارەدا کەڵەکە بوون و رۆژانەکان لەکاتی خۆیدا دەدران.

دەستەیەك لەزەنگییەکان بەشێك لەئوردووگاکەی نەسیریان تالان کرد و پەلاماریاندا.

موەفەق فەرمانی بەنەسیردا ئوردووگاکەی خۆی کۆبکاتەوە و بیپارێزێت. هەروەها فەرمانی بەباوکی عەباسی کوڕیدا هێرش بکاتە سەر زەنگییەکانی دەرەوەی شارەکە. باوکی عەباس هێرشی کردەسەریان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و سامانەکانی تالان کرد. دەستەیەك لەوان داوای ئەمانیان کرد. باوکی عەباس ئەمانی پێ بەخشین و خەلاتی کردن. باوکی ئەحمەد بەبەخشش وپارە بەو کەسانەی پەیوەستی دەبوون، فێڵی لەساحەبی زەنج دەکرد و کەسانی دیکەی ناکاوگیر و تەنگی پێ هەڵدەچنین.

کاروانێك لەئەهوازەوە هات و بێهبود (سەرکردەی زەنگی) لەگەڵ بەلەمە جەنگییەکان بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر و تالانی کرد. ئەمە بۆ موەفەق دژوار بوو و قەرەبووی زیان لێکەوتووانی کردەوە و فەرمانیدا کەشتییە جەنگییەکان لەناو رووبارەکان جێگیر بکەن و کاری پاراستنی رووبارەکان و

کەشتییەکانی بەباوکی عەباس سپارد.

لەرەمەزان/ ئاوریلی ئەم ساڵە دەستەیەك لەهاوەڵانی ساحەبی زەنج مەبەستی جەنگ لەگەڵ نەسیریان کرد. خەڵکان ئاگادار بوونەوە و هێرشیان کردە سەریان و دەریانپەڕاندن و هیوای ئەوانیان کردە بڵقی سەر ئاو. خەڵکان سەندەلی زەنگییان گرت. سەندەل ئەو کەسەیە بوو سەرپۆشی لەسەر ژنە موسوڵمانەکان هەڵدەگرت و هاوشێوەی کۆیلە هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکردن. کاتێك ئەویان هێنا، موەفەق فەرمانی تیربارانی ئەوی دەرکرد و بەم شێوەی کوشتیان.

ژمارەیەك لەزەنگییەکان داوای ئەمانیان لەموەفەق کرد. ژمارەی ئەو کەسانەی خوازیاری ئەمان بوون لەکۆتایی رەمەزان/ پێنجی مەی دەگەیشتە پەنجا هەزار کەس.

لەشەوال/ جونی ئەم ساڵە ساحەبی زەنج لەسوپاکەی خۆی پێنج هەزار جەنگاوەری بوێر و سەرکردەی هەڵبژارد و فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەباندا بۆ سەرکوت کردنی ئوردووگاکەی موەفەق بەرێکەوێت. لەناو ئەم سوپایە دووسەد سەرکردە دەبینرا. ئەوان شەوانە رێگەی خۆیان کردەوە و لەکۆتایی دارستانەکانی خورما خۆیان حەشاردا. ساحەبی زەنج فەرمانی پێدابوون ئەو کاتەی سەرکردەکان لەپێشەوە سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ سوپاکەی موەفەقن، کاتێك هێرش بکەنە سەر ئوردووگاکەی موەفەق کەسوپاکەی سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ ئەو سەربازانەن کە لەبەردەم ئەوان دەجەنگن و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکەنە سەریان. یەکێك لەمەلەوانەکانی ساحەبی زەنج داوای ئەمانی لەموەفەق کرد و موەفەقی لەم مەبەستە ئاگادار کردەوە. ئەو کوڕەکەی باوکی عەباسی بۆ جەنگی ئەوان و چاودێری کردنی دوژمن ڕەوانە کرد. جەنگێکی قورس روویدا و زۆربەی ئەوان ئەسیر کران و ژمارەیەکی زۆریان خنکان و ژمارەیەکیان کوژران و دەستەیەك هەڵاتن. باوکی عەباس فەرمانیدا ئەسیرەکان، سەربڕاوەکان و بەلەمە تاڵان کراوەکان لەنزیك شاری ساحەبی زەنج گوزەر بدەن بۆ ئەوەی خەڵکان بیانبینن. ئەو کارەیان کرد.

موەفەق ئاگادار بوویەوە ساحەبی زەنج بەهاوەڵانی خۆی وتووە: ئەسیرەکان

لەو کەسانە بوون کەداوای ئەمانیان کردووە و سەری براوەکان تایبەتە بەفریودراوەکان. موەفەق فەرمانیدا سەرە براوەکان بەبەرد هاوێژەکان بۆ ناو شارەکە بهاوێژن بۆ ئەوەی بناسرێنەوە. کاتێك بنەماڵەکانیان سەری ئەوانیان دۆزییەوە، شینیان کرد و درۆکەی ساحەبی زەنجیان بۆ دەرکەوت.

هەروەها لەم ساڵەدا ساحەبی زەنج فەرمانیدا کەشتییە تازەکان دروست بکەن. پەنجا کەشتی تازەیان بۆ دروست کرد و ئەو، لەناو سەرکردەکانی دابەشی کرد و فەرمانی پێدان بۆ شەڕ لەگەڵ سوپاکەی موەفەق بەرێکەون. لەم کاتەدا ژمارەی کەشتییە جەنگییەکانی موەفەق کەم بوو چوونکە ئەوەی فەرمانی دروست کردنی دابوو، هێشتا نەگەیشتبووە بەردەستی و کەشتییەکانی بۆ ناو رووبارەکان ڕەوانە کردبوو بۆ ئەوەی رێگە لەگەیشتنی خواردەمەنی بۆ شار ساحەبی زەنج بگرن. ترس کەوتە ناو دڵی سوپاکەی موەفەق بەڵام لەم کاتەدا کەشتییەکانی موەفەق دەرکەوتن. فەرمانی بەباوکی عەباسی کوڕیدا کەشتییەکان لەو شوێنانەی مەترسیان لەسەر بوو، جێگیر بکات. کاتێك باوکی عەباس کەشتییەکانی هێنا، زەنگییەکان بینیان و بۆ جەنگی ئەوان خێراییان لەخۆیان نیشاندا و کەشتییەکانی خۆیان هێنایە گۆڕەپانی جەنگ. لەم کاتەدا یەکێك لەکۆیلەکانی باوکی عەباس هێرشی کردە سەریان و شکستی بەزەنگییەکان هێنا و پاشەکشێی پێکردن. سوپای زەنگییەکان تێکشکا. ئەم کۆیلەیە تا ئەو کاتەی زەنگییەکان گەیشتنە رووباری باوکی خەسیب، شوێنیان کەوت بەڵام لەهاوەڵانی جیابوویەوە و زەنگییەکان لەپشتەوە هێرشیان کردەسەر و دوای جەنگێکی سەخت، هەموویان کوژران و زەنگییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. بەڵام کەشتییەکانی باوکی عەباس بێ زیان گەڕانەوە و سەر لەنوێ جەنگاوەرانیان لەناو کەشتییەکان جێگیر کرد.

لەم کاتەدا کەشتییە جەنگییەکانی ساحەبی زەنج وەك هەمیشە دەرکەوتن (خواردنیان بۆ ساحەبی زەنج دەهێنا.) باوکی عەباس و سوپاکەی هێرشیان کردنەسەر و شکستیان پێهێنان و چەند کەشتییەکیان وەك تاڵانی دەست کەوت و سەرنشینەکانیان کوشت. ساحەبی زەنج دوای بینینی ئەم رووداوە چیتر مۆڵەتی

ڕۆشتنەدەرەوەی بەسوپاکەی نەدەدا. باوکی عەباس ڕێگەی نەدا خواردەمەنی بەزەنگییەکان بگات. دەنگی ئەوان بەرز بوویەوە و دەستەیەك لەسەرکردەکانیان داوای ئەمانیان کرد و پێیان بەخشرا. یەکێك لەوان محەممەد کوڕی حەرەسی قومی بوو کە لەبەرابەر سوپاکەی موەفەق پارێزگاری لە دیوارەکان دەکرد. ئەو شەوانە پەیوەستی ئوردووگاکەی موەفەق بوو. موەفەق ئەمانی پێبەخشی و خەلاتی زۆری بەخۆی و هاوەلانیدا لەگەڵ ئەسپ و زێر و زیو. محەممەد مەبەستی ئەوەی کرد هاوسەرەکەی لەشاری زەنگییەکان بێنێتەدەر بەلام نەیتوانی و ساحەبی زەنج هاوسەرەکەی گرت و فرۆشتی. لەو کەسانەی پەیوەستی موەفەق بوون یەکیان ئەحمەد یەربوعی بوو کە بەیەکێك لەبوێرترین و ئازاترین سەرکردەکانی ساحەبی زەنج هەژمار دەکرا. جگە لەم دوانە کەسانێکی زۆری دیکە پەیوەستی سوپاکەی موەفەق بوون و خەلاتییان پێ بەخشرا.

کاتێك خواردەمەنی و کالاکانی دیکە بەدەستی ساحەبی زەنج نەدەگەیشت، شیبل و باوکی بەزی (لەسەرکردە باوەڕپێکراوەکانی) لەگەڵ دە هەزار کەس لەسێ لاوە بۆ بەتیحە نارد تا هێرش بکەنە سەر موسوڵمانەکان و ڕێگە نەدەن خواردەمەنی بەسوپاکەی موەفەق بگات. موەفەق، زیرەکی لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ گۆڕەپان ڕەوانە کرد. کاتێك زیرەك لەڕووباری باوکی عومر ئەوانی بینی، لەزۆری ژمارەی ئەوان ترسا و لەخواوەند پاڕایەوە و هێرشی کردە سەر دوژمن و جەنگی دەست پێکرد. خواوەند ترسی خستە دڵی دوژمنان و هەموویان تێکشکان. زیرەك ژمارەیەکی زۆری کوشت. ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ژمارەیەکی زۆریان لەناو ئاودا خنکان و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر کرا و ژمارەیەکی زۆری کەشتییەکانیان تالان یا لەئاوەکەدا نغرۆ بوون. ئەو چوارسەد کەشتی وەك تالانی دەستکەوت و لەگەڵ ئەسیر و سەرە بڕاوەکان بۆ لای موەفەق گەڕایەوە.

## ڕۆشتنی موەفەق بۆ شاری ساحەبی زەنج

لەبیست و شەشی زیحەججە/ بیست و حەوتی جولای موەفەق بەرەو شاری ساحەبی زەنج بەرێکەوت. بزوێنەری بۆ ئەم کارە ئەوە بوو دەستەیەك لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج کاتێك پەرێشانی ژمارەیەك لەهاوەڵانی خۆیان بینی کەرووبەرووی موەفەق دەبوونەوە و هەستیان بەدژواری و تاڵی گەمارۆی سەرشارەکەیان کرد و دەیانبینی ژمارەیەکی زۆر خوازیاری وەرگرتنی ئەمانن، هاتنە لای موەفەق و داوای ئەمانیان کرد.

ساحەبی زەنج کەسانێکی لەسەر ڕێگەکان دانا کەئەوکەسانەی خوازیاری وەرگرتنی ئەمان بوون دەیانتوانی بەئاسانی لەدەستی ئەوان خۆیان دەرباز بکەن. دەستەیەك لەسەرکردەکانی زەنگی پەیامیان بۆ موەفەق نارد و داوای ئەمانیان کرد و پێشنیاریان کرد سوپایەك بۆ جەنگی ساحەبی زەنج ڕەوانە بکات بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ پەیوەست بوونی ئەوان بکرێتەوە. موەفەق فەرمانی بەباوکی عەباسی کوڕیدا بەرەو ڕووباری ڕۆژئاوا بڕوات. عەلی کوڕی ئەبان پارێزگاری لەم ڕووبارە دەکرد. باوکی عەباس لەگەڵ کەشتی و بەلەمە جەنگییەکان و پردە جوڵاوەکان مەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوی کرد. جەنگ لەنێوان ئەو دوانە دەستی پێکرد و ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند. باوکی عەباس سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ساحەبی زەنج، سلێمان کوڕی جامیعی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد. جەنگ لەبەرەبەیان تا ئێوارێ درێژەی کێشا و دووبارە سەرکەوتن بەباوکی عەباس بڕا. ئەو دەستەی داوای ئەمانیان کردبوو و چاوەڕوانی دەرفەتی گونجاو بوون، لەم کاتەدا پەیوەستی سوپاکەی باوکی عەباس بوون.

باوکی عەباس لەشاری ساحەبی زەنج لەنزیك ڕووباری ئەتراك گوزەری کرد و لەوێ، ژمارەیەکی کەمی زەنگییەکانی بینی و چاوی تەماحی بڕییە گرفتار کردنی ئەوان. سوپاکەی باوکی عەباس مەبەستی ئەوانیان کرد و ئەمە لەکاتێکدا بوو زۆرینەی سوپاکەی باوکی عەابس گەڕابوونەوە بۆ موەفەقییە. ئەوان کەوتنە سەر

ڕێگەی زەنگییەکان. دەستەیەك لەزەنگییەکان لەدیوارەکە هاتنەخوار و دەستەیەکیان لەسەرەوەی دیوارەکە بوون. ئەوان هەرکەس لەهاوەڵانی سوپاکەی عەباسیان بینی، کوشتیان. ساحەبی زەنج کاتێك دەنگەدەنگی بیست، سوپاکەی بۆ جەنگ کۆکردەوە. باوکی عەباس کاتێك جموجۆڵی ئەوانی بینی، پەیامی بۆ موەفەق نارد بۆ ئەوەی هێزی هاوکاری بۆ ڕەوانە بکات. هەموو کەسە چالاکەکان کۆبوونەوە. ئەم دەستەیە هێرشیان کردە سەر زەنگییەکان و بەهەڵاتن ناچاریان کردن.

سلێمان کوڕی جامیع کاتێك سەرکەوتنی باوکی عەباسی بینی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان بەرەو سەرەوەی ڕووبارەکە بەڕێکەوت و خۆی گەیاندە پشت سەری سوپاکەی باوکی عەباس. ئەمە لەکاتێکدا باوکی عەباس و سوپاکەی سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ سوپاکەی ڕووبەڕووی خۆیان بوون. زەنگییەکان لەناکاو فوویان کرد بەکەڕەناکاندا و سوپاکەی باوکی عەباس بڵاوەیان لێکرد و هەڵاتوانی زەنگی جارێکی دیکە گەڕانەوە و دەستەیەك لەبەندەکانی موەفەقیان کوشت و دەستیان بەسەر چەند ئاڵایەکدا گرت. لەم کاتەدا باوکی عەباس بۆ هاوکاری کردنی سوپاکەی ئەسپی غاردا و بەم شێوەیە زۆرینەی ئەوان بێ زیان بۆ ئوردووگا گەڕانەوە.

زەنگییەکان فریوی ئەم سەرکەوتنەیان خوارد و ورەیان بەرز بوویەوە. موەفەق بڕیاریدا لەگەڵ هەموو سوپاکەی لەشاری زەنگییەکان گوزەر بکات. ئەو هەموو هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و پردە جولاّ و کەشتییەکانی خۆی ئامادە و لەنێوان سوپاکەی دابەشی کرد و لەڕۆژی چوارشەممە بیست و شەشی زیحەجحە/ بیست و حەوتی جولای هاوەڵانی خۆی لەشارەکەدا بڵاو کردەوە تا ساحەبی زەنجیش ناچار بەبڵاو کردنەوەی سوپاکەی بێت. موەفەق مەبەستی بەهێزترین شوێنی شارەکەی کرد. ساحەبی زەنج، ئەنکلای و سلێمان کوڕی جامیع و عەلی کوڕی ئەبان و کەسانی دیکەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەبەرد هاوێژ و کەرەستەکانی جەنگ لەوێ جێگیر کردبوو.

کاتێك دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، موەفەق فەرمانی بەبەندەکانیدا لەو

شوێنە نزیك ببنەوە. رووباری ئەتراك ئەوانی لەدیوارەكە جیا دەكردەوە. ئەم رووبارە هەم پان بوو هەم ئاوەكەی خرۆشاو. هاوەڵانی موەفەق كاتێك گەیشتنە ئەو شوێنە، رێگەی ڕۆشتنیان لێ گیرا. لەم كاتەدا موەفەق فەرمانی پێدان و بۆ گوزەر كردن لەو رێگەیە هانیدان. ئەوان بەمەلە كردن رووبارەكەیان بڕی. زەنگییەكان بەكەشكەنجیر و بەردهاوێژ و تیر و وردە برد، ئەوانیان كردە نیشانە. سوپاكەی موەفەق خۆڕاگری كرد و لەرووبارەكە پەڕینەوە و خۆیان گەیاندە دیوارەكە. ئەو كرێكارانەی ئەركی وێران كردنی دیوارەكەیان لەسەر شان بوو، هێشتا نەهاتبوون. بەندەكان بەكەرەستەكانی جەنگی خۆیان دەستیان بەوێران كردنی دیوارەكە كرد و خواوەند ئەم كارەی بۆ ئاسان كردن. ئەوان چەند پەیژەیەكیان پێبوو و بەهۆیەوە توانیان بەدیوارەكەدا سەركەون و ئاڵایەك لەئاڵاكانی موەفەق لەسەرەوەی دیوارەكە جێگیر بكەن. زەنگییەكان بەهۆی ئەم كارەوە شڵەژان. سوپاكەی موەفەق دوای جەنگێكی گیانبڕ توانیان پارێزگاری لەم ئاڵایە بكەن. ژمارەیەكی زۆر لەهەردوو سوپا كوژران و كاتێك سوپاكەی موەفەق ڕۆشتە سەر دیوارەكە، ئەوەی بەرد هاوێژ و كەوانیان بەردەستكەوت، سوتاندیان.

باوكی عەباس مەبەستی ناوچەیەكی دیكەی كرد و عەلی كوڕی ئەبان بۆ جەنگی ئەو بەرێكەوت بەڵام باوكی عەباس شكستی پێهێنا و ژمارەیەكی زۆر لەهاوەڵانی كوشت. عەلی خۆی رزگار كرد. سوپاكەی باوكی عەباس گەیشتنە دیوارەكە و كەلێنێكی گەورەیان تیا دروست كرد و ڕۆشتنە ناو شارکە. سلێمان كوڕی جامیع رووبەروویان بوویەوە و جەنگی لەگەڵ سوپاكەی باوكی عەبّاس ئەنجامدا و ناچاری كردن بۆ شوێنی یەكەمیان بگەڕێنەوە بەڵام لەم كاتەدا كرێكارەكان گەیشتن و دیوارەكەیان لەچەند شوێنێكی دیكەوە وێران كرد و لەسەر خەندەكەكە پردێكیان هەڵبەست و سوپاكەی موەفەق لەو پردە گوزەریان كرد. زەنگییەكان لەو دەروازەی پەنایان بۆ بردبوو، هەڵاتن و هاوەڵانی موەفەق تا ئەو جێگەی دەیانتوانی لەزەنگییەكانیان كوشت تا ئەوەی گەیشتنە رووباری كوڕی سەمعان. ماڵی كوڕی سەمعان لەلایەن هێزەكانی موەفەقەوە دەستی بەسەردا گیرا و سوتاندیان. زەنگییەكان لەوێ رووبەرووی سوپاكەی موەفەق بوونەوە بەڵام

شکستیان خوارد و گەڕانەوە بۆ گۆڕەپانی ساحەبی زەنج. ساحەبی زەنج لەگەڵ دەستەیەك لەوان سوار ئەسپەکەی بوو بەڵام هاوەڵانی هەڵاتن. یەکێك لەپیادەکانی موەفەق لێی نزیك کەوتەوە و بەقەڵغانەکەی لەتەوێڵی ئەسپەکەیدا. ئەم پێشهاتە لەکاتی ئاوابوونی هەتاو روویدا. موەفەق فەرمانی گەڕانەوەیدا و سوپاکەی گەڕایەوە. ژمارەیەکی زۆری سەرە براوەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا.

لەسەرەتای رۆژ ژمارەیەك لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج داوای ئەمانیان لەباوکی عەباس کرد. ئەو لەکاتی گەڕانەوە ماوەیەك خۆی دوا خست تا بەکەشتی ئەوان لەگەڵ خۆی ببات. شەو داهات و تۆفانێکی سەخت هەڵیکرد و داکشان دەستی پێکرد و ئاو دامرکایەوە و زۆربەی کەشتییەکان لەقوڕ چەقین. دەستەیەك لەزەنگییەکان هاتنەدەر و زیانیان لێدان و ژمارەیەك لەوانیان کوشت. بێهبود لەبەرابەر مەسروری بەلخی جێگیر ببوو، شەڕی دژی هاوەڵانی مەسرور دەست پێکرد و ژمارەیەکی لەوان کوشت و ئەسیری کرد و ئەمە لەجموجۆڵی هاوەڵانی موەفەقی کەم کردەوە.

بەشێك لەجەنگاوەرانی ساحەبی زەنج، بێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە بەرەو رووباری ئەمیر و قێندل و ئابادان هەڵاتن. دەستەیەك لەعەرەبە بیابان نشینەکانی شوێنکەوتەی ساحەبی زەنج روویان کردە بەسرە و داوای ئەمانیان لەموەفەق کرد و پێیان بەخشرا و خەڵاتیان پێ درا و ناوی لەناو پێرستی سوپاییەکاندا نووسی. یەکێك لەو کەسانەی داوای ئەمانی کرد رەیحان کوڕی ساڵحی مەغربی لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج بوو. ئەو داوای ئەمانی کرد و پەیامی نارد تا موەفەق دەستەیەك بۆ ئەو شوێنەی باسی دەکات، رەوانە بکات بۆ ئەوەی خۆی و هاوەڵانی پەیوەستی موەفەق بن. موەفەق ئەو کارەی کرد. رەیحان هاتە لای موەفەق و پاداشتی پێ بەخشرا و رێزی گرت و دواتر تەسلیم بەباوکی عەباسی کرد. کەمێك دواتر دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەو داوای ئەمانیان کرد. پەیوەست بوونی رەیحان بەموەفەق لەشەوی کۆتایی زیحەججە/ بیست و دووی جولای ئەم ساڵە روویدا.

## جەنگی خەواریج لەموسڵ

لەم ساڵەدا لەنێوان هارونی خارجی و محەممەد کوڕی فەرزاد (ئەویش لەخەواریج) لەبەدرا لەدەوروبەری موسڵ جەنگ روویدا.

پێشتر لەساڵی ٨٧٧/٢٦٣ زایینی جەنگ لەنێوان هارون و محەممەدمان دوای مەرگی موساور باس کرد. لەساڵی ٨٨١/٢٦٧ زایینی لەواست، محەممەد کوڕی فەرزاد سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و بۆ شەڕی هارون بەرێکەوت و لەواست لەنزیك موسڵ ئوردووی لێدا. ئەو سواری گا ببوو بۆ ئەوەی لەگۆڕەپانی جەنگ رانەکات و پەشمینەی لەبەر دەکرد و خۆی پینەی جل و بەرگەکانی دەگرت و بەردەوام سەرقاڵی پەرەستش و پاڕانەوە بوو و بێ راخەڕ لەسەر زەوی دادەنیشت. محەممەد کاتێك هاتە واست، سەرکردەکانی موسڵ بۆ بینینی لەدەوری کۆبوونەوە و هارون لەمەعلەسایا هێزی کۆدەکردەوە. کاتێك هارون لەڕۆشتنی محەممەد بۆ موسڵ ئاگادار بوویەوە، بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. محەممەد رووبەرووی بوویەوە و هەردووك لەنزیك گوندی شەمرەخ بەیەك گەیشتن و جەنگێکی قورس کەهەم لەخۆگری شەڕی دەستەویەخە و هێرشی بەکۆمەڵ بوو، دەستی پێکرد و سەرئەنجام هارون شکستی خوارد و دووسەد کەس لەسوپاکەی کوژران کەدەستەیەك لەشاسوارە ناودارەکان لەناو کوژراوەکاندا دەبینران. هارون هەڵات و لەدیجلە پەڕییەوە و مەبەستی بیابان نشینەکانی مناڵەکانی تەغلەبی کرد. ئەوان هاوکارییان کرد و لەدەوری کۆبوونەوە. کوڕی فەرزاد بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. هارون رووی کردە حەدیسە و ژمارەیەکی فراوان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو نامەی بۆ شوێنکەوتەکانی کوڕی فەرزاد دەنووسی و دڵنەوایی و بەڵێنی چاکەی پێدەدان و بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆریان پەیوەستی بوون وکەس لای فەرزاد نەمایەوە مەگەر خزمەکانی لەشەمردەلیە کە لەدانیشتوانی شارەزوور بوون. هاوەڵانی کوڕی فەرزاد لێی جیابوونەوە چوونکە ژیانی لەشارەزووردا لێ دژوار

کردبوون. ئەم شارە لێوانلێبوو لەدوژمنە کوردەکان[١٣] و کەسانی دیکە. بەڵام بارودۆخی هارون و شوێنکەوتەکانی لەموسڵ سەقامگیر بوو. کاتێك هاوەڵانی فەرزاد ئەمەیان بینی، پەیوەستی هارون بوون. کوڕی فەرزاد لەکەنارەکانی شارەزوور لەگەڵ کوردە جەلالییەکان وکەسانی دیکە جەنگی و لەکۆتاییدا کوژرا و بەم شێوەیە پێشەوای خەواریج بۆ هارون مایەوە و پێگەی بەرز بوویەوە و شوێنکەوتەکانی زیادیان کرد و دەستی بەسەر گوندەکاندا گرت وکەسەکانی خۆی وەك کارگوزارەکانی دیجلە ڕەوانە کرد تا لەو کەسانەی هاتوچۆ دەکەن زەکات وەربگرن. نوێنەرەکانی ئەو لەگوندەکان دەیەکی شاماخ[١٤] یان وەردەگرت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا کوڕی حەفسون لەکەنارەکانی ڕییە لەئاندۆلۆس لەگەڵ محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر. فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە بەسوپا ڕووبەڕووی بوویەوە بەڵام شکستی خوارد و پێگەی کوڕی حەفسون بەرز بوویەوە و ناوی دەرکرد و خراپەکاران لەدەوری کۆبوونەوە. محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، فەرماندەیەکی دیکەی لەگەڵ سوپایەك بۆ ئەو ناوچەیە ڕەوانە کرد و عومەر کوڕی حەفسون ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر. فەرماندە داوای هەموو هاودەستەکانی عومەری کرد و ئەوانی کوشت و دەستەیەکی لەئاندۆلۆس دەرکرد و بەم شێوەیە ئارامی بۆ ئەو ناوچە گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا ئەرد هەژێنێکی گەورە، شام، میسر، سەرزەمینی جەزیرە، ئەفریقییە و ئەندۆلۆسی لەرزاند. دواتریش ئەردهەژێنێکی دیکە ڕوویدا.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەباس وەك فەرمانڕەوای سیسیل دیاری کرا و چەندین دەستەی بۆ کەنارەکان ڕەوانە کرد. ئەو ڕۆشتە قەتانییە و زەوییە کشتوکاڵییەکانی وێران و تەبەرمینی خاپور کرد و دارەکانی بڕییەوە. دواتر

[١٣] – لێرەدا کوردەکان کەخاوەنی سەرەکی خاکەکەن بەبێگانە و دوژمن ناو دەبرێن لەگەڵ ئەوەی کوڕی فەرزاد خۆی کورد بووە. (وەرگێڕ)

[١٤] شاماخ: دانەوێڵە (وەرگێڕ)

ڕێگەی بوقارەی گرتەبەر وزەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەو دەڤەریشی لەناوبرد و بۆ بەلەرم گەڕایەوە. ڕۆمییەکانیش چەندین دەستەیان ڕەوانە کرد و لەڕۆژگاری حەسەن کوڕی عەباس ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانانیان کوشت.

هەروەها لەم ساڵەدا خەلیفە، محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر (یا محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە) و دەستەیەك لەئەندامانی بنەماڵەکەی زیندانی کرد. ئەمە دوای سەرکەوتنی خوجوستانی بەسەر عەمرۆ کوڕی لەیسدا بوو چوونکە عەمرۆ، محەممەد بەنامە نووسی بۆ خوجوستانی و حسەین کوڕی تاهیر تاوانبار کرد لەبەر ئەوەی خوجوستانی و حسین کوڕی تاهیر هەردووك ناوی محەممەد کوڕی تاهیریان لەسەر مینبەر دەبرد و لەخوراسان وتار بەناوی ئەو دەخوێندرایەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان کەیغلەغی تورك و هاوەڵانی ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف شەڕ ڕوویدا و لەکۆتاییەدا سوپاکەی ئەحمەد شکستیان خوارد و کەیغەلغ تا هەمەدان ڕۆشتە پێش. دواتر ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز بەو سوپایەی کۆی کردبوویەوە، دووبارە هێرشی کردەسەر و ئەم جارە کەیغلەغ هەڵات و ڕووی کردە سەیمەرە.

لەرەبیع الاخر/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە دایکی حەبیب کچی ڕەشید مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەنێوان ئیسحاق کوڕی کونداجیق و ئیسحاق کوڕی ئەیوب و عیسا کوڕی شێخ و باوکی موغرا و حەمەدان کوڕی حەمدون و کەسانی دەوروبەریان لەهۆزی ڕەبیعە و تەغلەب و بەکر و یەمەن جەنگ رویدا و کوڕی کونداجیق تا نەسیبین پاشەکشێی پێکردن و تا ئامەد (دیاربەکر) شوێنیان کەوت و کەسی بۆ دانان تا گەمارۆ بخەنە سەر عیسا. لەنێوان ئەوان چەندین جەنگ ڕوویدا.

هەروەها لەم ساڵەدا خوجوستانی هاتە نەیشابور و عەمرۆ کوڕی لەیس و هاوەڵانی هەڵاتن. خوجوستانی بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ خەڵکی نەیشابور کرد و ماڵی موعاز کوڕی موسلیمی وێران کرد. ئەو ناوی محەممەد کوڕی تاهیری نەهێشت و هەمووانی بۆ بەیعەت لەگەڵ موعتەمید و خۆی هاندا.

لەشەوال/ مەی ئەم ساڵە، هاوەڵانی باوکی ساج لەگەڵ هەیسەمی عیجلی جەنگان و پێشەنگەکەی ئەویان کوشت و لەشکرگاکەیان تالآن کرد.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عەبدوللەی خوجوستانی مەبەستی عێراقی کرد و گەیشتە سمنان. دانیشتوانی ئەو شارە لەوێ سەنگەریان گرتبوو. ئەو بەناچاری بۆ خوراسان گەڕایەوە.

هەورەها لەم ساڵەدا ژمارەیەکی زۆر لەحاجییەکان لەبەر گەرمای تاقەت پروکێن لەرێگەی مەککە گەڕانەوە و ژمارەیەکی نەگەڕانەوە و ژمارەیەکی زۆر لەوانەی نەگەڕانەوە لەتاو بێ ئاوی و تینویەتی توانای خۆیان لەدەستدا و مردن. چوونکە بیابان بوو و ئاو دەست نەدەکەوت.

هۆزی فەزار هێرشیان کردە سەر کاروانی بازرگانەکان و فڕاندیان. گومان دەکرا حەوتسەد باری کەل و پەل بێت.

هەروەها لەم ساڵەدا تەباع لەسامەرا دوورخرایەوە.

لەم ساڵەدا خوجوستانی بەناوی خۆیەوە درەم و دیناری لێدا.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیسای هاشمی رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی حیماد کوڕی بەکر کوڕی حیماد ئەبوبەکری موقری هاورێی خەلەف کوڕی هوشام لەمانگی رەبیع الاوەل/ نۆڤەمبەر لەبەغداد، کۆچی دوای کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەست و هەشتی کۆچی ( ٨٨٢ زایینی )

### بەسەرهاتی زەنگییەکان

لەموحەرەم/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە جەعفەر کوڕی ئیبراهیم ناسراو بەسەحان لەسەرکردەکان و باوەڕپێکراوەکانی ساحەبی زەنج، پەنای بۆ موەفەق برد. ساحەبی زەنج ترسا. موەفەق پاداشتی بەجەعفەر بەخشی و ڕێزی لێگرت و سواری بەلەمێکی کرد و لەبەردەم کۆشکەکەی ساحەبی زەنج سوڕاندی. ئەو لەگەڵ هاوەڵانی قسەی کرد و ئەوانی هاندا و ئەوەی لەخراپەکاری و درۆکانی ساحەبی زەنج دەیزانی، ئەوانی لێ ئاگادار کردەوە. لەم ڕۆژەدا ژمارەیەکی دیکە لەسەرکردە و سالارەکانی ساحەبی زەنج داوای ئەمانیان کرد. موەفەق ڕێزی لەهەموویان کرد و بەم شێوەیە بەردەوام ژمارەی ئەوکەسانەی داوای ئەمانیان دەکرد، زیاد دەبوو.؟

دواتر موەفەق تا کۆتایی رەبیع الاخر، ئۆکتۆبەر مایەوە بۆ ئەوەی سوپاکەی بحەوێتەوە. کاتێك نیوەی رەبیع الاخر/ پانزەی نۆڤەمبەر دەستی پێکرد، موەفەق مەبەستی گرتنی شاری ساحەبی زەنجی کرد. سەرکردەکانی خۆی بۆ هەموو سوچ و قوڵەکان نارد. لەهەر دەستەیەك ژمارەیەك لەکرێکارەکانی جێگیر کرد تا دیواری شارەکە بروخێنن. فەرمانی بەهەمواندا دوای ڕووخاندنی دیوارەکە زیاتر پێشڕەوی نەکەن و نەڕۆنە ناو شارەکە. فەرمانی بەتیر هاوێژەکاندا بەتیر هاویشتن پشتیوانی لەوکەسانە بکەن کەسەرقاڵی وێران کردنی دیوارەکەن.. شەڕکەران لەهەموو ناوچەکانەوە هێرشیان کردە سەر شارەکە و لەدیوارەکە نزیك بوونەوە و لەچەند شوێنێکەوە روخاندیان. سوپاکەی موەفەق لەم شوێنانەوە ڕۆشتنە ناو. سوپاکەی ساحەبی زەنج ڕووبەڕوویان بوویەوە بەڵام سەربازەکانی موەفەق بەهەڵاتن ناچاریان کردن و لەئەنجامی شوێنکەوتنی ئەوان تا قوڵایی شارەکە ڕۆشتنە پێش و لەرێگە جۆراوجۆرەکانی شار، دوور لەشوێنی یەکەمی خۆیان بڵاو بوونەوە. لەسەر هەر رێگا هەرچییان بینی، سوتاندیان و هەرکەسیان بینی، ئەسیریان کرد. زەنگییەکان دووبارە بۆ جەنگی ئەوان خۆیان کۆ کردەوە و ئەوانەی

خۆیان شاردبوویەوە، هاتنەدەر و سەربازەکانی موەفەق سەرگەردان بوون و بەرگرییان لەخۆیان کرد و دوای ئەوەی ژمارەیەکیان لێ کوژرا، بۆ دیجلە گەڕانەوە. زەنگییەکان جل و بەرگ و کەرەستەکانی ئەوانیان تالاَن کرد.

موەفەق بۆ شارەکەی خۆی گەڕایەوە و فەرمانیدا سەرپازە بەربلاَوەکان کۆبکەنەوە و بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی سەرکۆنەی کردن و فەرمانی پێدان کوژراوەکان بژمێرن تا ڕۆژانە بەژن و منالەکانیان بدەن. سەربازەکان ئەم کارەیان پەسەند و ورە و پشت ئەستوری ئەوان زیادی کرد.

## شەڕی موعتەزید لەگەڵ عەرەبە دەشتەکییەکان

لەم ساڵەدا باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی موەفەق یا هەمان موعتەزید (دوای گەیشتن بەخەلافەت) هێرشی کردە سەر دەستەیەك لەعەرەبە دەشتەکییەکان کەخواردەمەنیان بۆ سوپاکەی ساحەبی زەنج دەبرد و ژمارەیەك لەوانی کوشت و ئەوانی دیکەی ئەسیر و سامانەکانی تالاَن کرد. کەسانێکی بۆ بەسرە نارد تا لەوێ بمێننەوە و ڕێگە نەدەن خواردەمەنی بەساحەبی زەنج بگات.

موەفەق، ڕەشیق، موالی منالەکانی عەباسی ڕەوانە کرد تا دەستەیەك لەمنالەکانی تەمیم سەرکوت بکات چوونکە خواردنیان بۆ ساحەبی زەنج دەبرد. ئەو زۆرینەی ئەم خەڵکەی کوشت و ژمارەیەکی ئەسیر کرد. ئەسیر و سەرە براوەکانی بۆ موەفەقییە نارد. موەفەق فەرمانیدا ئەوان نیشانی زەنگییەکان بدەن. لەناو ئەسیرەکان دەست و پێی پیاوێکیان بڕییەوە کەبۆ گەیاندنی خواردەمەنی لەنێوان ساحەبی زەنج و عەرەبە دەشتەکییەکان نێوەنجیگەری دەکرد و دواتر فڕیاندا بۆ ناو ئوردووگاکەی ساحەبی زەنج. موەفەق فەرمانیدا ئەسیرەکان سەر ببڕن و بەمشێوەیە چیتر خواردەمەنی بەساحەبی زەنج نەدەگەیشت. ئەم گەمارۆیە بەئەندازەیەك زیانی لەزەنگییەکاندا کەهەموویان لەڕ و لاواز بوون. ئەگەر لەگرفتار یا پەنابەرێك پرسیار دەکرا لەکەیەوە نانت نەخواردووە، وەلاَمی دەدایەوە، دەمێکەیە نانم نەبینیوە.

کاتێك بارودۆخ گەیشتە ئێرە، موەفەق بەباشی زانی بەردەوام هێرشیان

بکاتەسەر تا هیلاکی و زیانەکانی ئەوان زیاد بکات. لەم کاتەدا ژمارەی ئەو کەسانەی داوای ئەمانیان دەکرد، زیادی کرد و ژمارەیەکی زۆر لەساحەبی زەنج جیابوونەوە و بۆ بەدەست هێنانی توێشو و خواردن بەرەو گوندەکان و ڕێگە دووردەستەکان هەڵاتن. ساحەبی زەنج لەهەڵاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە و ئەو دەستەیەك لەسەرکردە ڕەشەکانی بۆ شوێنەکانی ئەوان ڕەوانە کرد تا پێشنیاری گەڕانەوەیان پێ بکەن و هەرکەس ڕازی نەبوو، خوێنی بڕێژن. نێردراوان، ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ژمارەیەکی زیاتر پەیوەستیان بوون.

کاتێك ژمارەی ئەو کەسانەی داوای ئەمانیان دەکرد، فراوان بوون، موەفەق بەناو ئەواندا گەڕا و هەرکەس لەوان هێز و وزەی زیاتری تیابوو، پەیوەستی دەستەی کۆیلەکانی خۆی کرد و هەرکەس ناتەوان یا بریندار بوو، جل و بەرگی پێ بەخشی و تیماری کرد و فەرمانی دەدا ئەو ببەنە ئوردووگای ساحەبی زەنج و بەو کەسەی دەوت تاهەمووان لەبارودۆخی خۆیان ئاگادار بکاتەوە و پێیان بڵێت هەرکەس پەیوەستی موەفەق ببێت، ڕێزی لێ دەگرن و جگە لەچاکە نابینن. بەم شێوە موەفەق بۆ دوورخستنەوەی سوپاکە لەساحەبی زەنج سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

موەفەق و کوڕەکەی باوکی عەباس بەردەوام لەگەڵ ساحەبی زەنج دەجەنگان، هەندێ کات موەفەق هێرشی دەبرد و هەندێ کات کوڕەکەی. لەم ناوەدا باوکی عەباس بریندار بوو بەڵام چاك بوویەوە.

لەناو ئەو کەسانەی کوژران، یەکیان بێهبود کوڕی عەبدوەهاب لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج بوو. ئەو بەبەلەمە جەنگییەکان دەهاتەدەر و ئاڵایەکی هاوشێوەی ئاڵاکانی موەفەقی هەڵدەکرد و لەم ڕێگەوە سامانی فراوانی کۆکردەوە. جارێك ڕووبەڕووی باوکی عەباس بوویەوە و بێهبود هەڵات. ئەو جارێکی دیکە ڕۆشتەدەر و بەلەمێکی بینی کەهاوەڵانی باوکی عەباس لەناویدا بوون. چاوی تەماحی تێبڕی و مەبەستی ئەوانی کرد بەڵام سەرنشینەکانی ناو کەشتییەکە ڕووبەڕووی بوونەوە و کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی باوکی عەباس سکی ئەوی بریندار کرد و ئەو کەوتە ناو ئاوەکە. هاوەڵانی هاوکارییان کرد و ئەویان بۆ ئوردووگاکەی ساحەبی زەنج

گەڕاندەوە بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئوردووگاکە مرد و خواوەند شەڕی ئەوی لەسەر موسوڵمانان کەم کردەوە.

کوشتنی یەکێك لەگەورەترین سەرکەوتنەکان بوو. ئەم بەڵایە بۆ ساحەبی زەنج و سوپاکەی دژوار و بۆ کوشتنی ئەو گریان. موەفەق لەکوژرانی ئەو ئاگادار بوویەوە و ئەو کۆیلەی بانگ کرد و پاداش و نیشانی پێ بەخشی و مووچەکەی بۆ زیاد کرد. هەروەها دیاری بەهاوەڵانی ئەو لەناو بەلەمەکە بەخشی. دواتر موەفەق دەوابنی لەهاوەڵانی ساحەبی زەنجی گرت.

## بەسەرهاتی رافیع کوڕی هەرسیمە

کاتێك ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلەی خوجوستانی لەم ساڵەدا کوژرا، هاوەڵانی بڕیاریاندا جڵەوی کارەکانی خۆیان بەرافیع کوڕی هەرسیمە بسپێرن.

رافیع لەهاوەڵانی محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوڵلە کوڕی تاهیر بوو. کاتێك یەعقوب کوڕی لەیس دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت و تاهیرییەکانی لەناو برد، رافیع پەیوەستی بوو و کاتێك یەعقوب لەسیستان گەڕایەوە، رافیع هاوڕێیەتی دەکرد. رافیع ریشی درێژ و روخساری قێزەون و روو گرژ بوو. رۆژێك هاتە لای یەعقوب و کاتێك رۆشتەدەر، یەعقوب وتی: ئەم پیاوەم خۆش ناوێت. با پەیوەستی کەسێك بێت کەخوازیارە. رافیع ئەم قسەی بیست و لەیەعقوب جیابوویەوە و بۆ ماڵەکەی لەتەمین لەدەوروبەری بادغەیس گەڕایەوە. لەوێ مایەوە تا خوجوستانی پێشنیاری پەیوەست بوون بەخۆی پێکرد و ئەوی وەك سەرکردەی سوپاکەی دانا.

کاتێك خوجوستانی کوژرا، سوپا بۆ فەرماندەیی رافیع لەهەرات هاوهەڵوێست بوون. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەویان کردە فەرمانڕەوای خۆیان. رافیع لەهەراتەوە هێرشی کردە سەر نەیشابور چوونکە باوکی تەڵحە کوڕی شورکەب لەجورجانەوە دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرتبوو. رافیع لەنەیشابور گەمارۆی خستەسەر و رێگەی نەدا خواردەمەنی پێ بگات. بەم شێوەیە بەهای کاڵاکان لەنەیشابور بەرز بوویەوە. باوکی تەڵحە نەیشابوری بەجێهێشت و رافیع رۆشتە ناو

شارەکە و لەوێ مایەوە. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٨٨٣/٢٦٩ زایینی روویدا باوکی تەڵحە روویکردە مەرو و محەممەد کوڕی موهتەدی وەك فەرمانڕەوای هەرات دیاریکرد و لەمەرو و هەرات بەناوی محەممەد کوڕی تاهیر وتاری خوێندەوە. عەمرۆ کوڕی لەیس مەبەستی باوکی تەڵحەی کرد و جەنگی هەڵگیرساند و شکستی پێهێنا. عەمرۆ مەروی بە محەممەد کوڕی سەهل کوڕی هاشم سپارد و گەڕایەوە و شورکەب (کوڕی شورکەب) بەرەو بیکەند بەرێکەوت و داوای هاوکاری لەئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی کرد. ئیسماعیل بەسوپایەك هاوکاری کرد. ئەو بۆ مەرو گەڕایەوە و محەممەد کوڕی سەهلی لەو شارە دەرپەڕاند و سامانی شارۆمەندانی تالأن کرد و بەناوی عەمرۆ کوڕی لەیس وتاری خوێندەوە. ئەم پێشهاتە لەشەعبانی ٢٧١/ ژانویەی ٨٨٥ زایینی روویدا.

موەفەق لەم ساڵەدا حکومەتی خوراسانی بە محەممەد کوڕی تاهیر (لەبەغداد بوو) سپارد. محەممەد، رافیع کوڕی هەرسیمەی وەك نوێنەری خۆی بۆ ئەم کەنارانە هەڵبژارد و تەنیا ماوەرا ئەلنەهری بەنەسر کوڕی ئەحمەد سپارد. نامەکانی موەفەق گەیشتە خوراسان کەعەمرۆ کوڕی لەیسی لەسەر کار لابردووە و نفرینی کردووە. رافیع بەرەو هەرات بەرێکەوت. هەرات لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی محەممەد کوڕی موهتەدی نوێنەری باوکی تەڵکە شورکەب بوو. یوسف کوڕی مەعبەد، محەممەد کوڕی موهتەدی کوشت و لەهەرات مایەوە. کاتێك رافیع گەیشتە هەرات، یوسف داوای ئەمانی کرد و پێی بەخشرا و لەوگوناحەی چاوی پۆشی و مەهدی کوڕی موحسنی وەك کارگوزاری هەرات دەستنیشان کرد. لەم کاتەدا رافیع داوای هاوکاری لەئیسماعیل کوڕی ئەحمەد کرد و ئەو خۆی لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بۆ هاوکاری رافیع ئەسپی غاردا. رافیع، عەلی کوڕی حسەینی مەرورودی بانگ کرد. ئەو هاتە لای رافیع. ئەمانە پێکەوە هێرشیان کردە سەر شورکەب لەمەرو. جەنگیان هەڵگیرساند و شکستیان پێهێنا. ئیسماعیل لەساڵی ٨٨٦/٢٧٢ زایینی بۆ موحازل گەڕایەوە. شورکەب رۆشتە هەرات و لەگەڵ مەهدی یەکیگرت و رێگەی ناسازگاری لەگەڵ رافیع گرتەبەر. رافیع مەبەستی جەنگی هەردووکیانی کرد و شکستی پێهێنان. شورکەب پەیوەستی عەمرۆ کوڕی لەیس و مەهدی

لەکاوی خۆی شاردەوە بەڵام رافیع گرتی و وتی: مەرگ شیاوی تۆیە ئەی پەیمان شکێن، دواتر لێی خۆش بوو و ئازادی کرد. رافیع لەساڵی ٨٨٦/٢٧٢ زایینی رێگەی خوارەزمی گرتەبەر و باجی کۆکردەوە و بۆ نەیشابور گەڕایەوە.

## روداوەکانی ئاندۆلۆس و ئەفریقییە

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، سوپایەکی بەفەرماندەیی مونزەر کوڕی بۆ جەنگی نەیاران ڕەوانە کرد. ئەو رووی کردە ساراگوزا و زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەو ناوچەی پێشێل و شارەکەی وێران کرد و دەستی بەسەر قەڵای وەرتەدا گرت و عەبدولواحیدی وەرتی گرت. ئەو یەکێك لەبوێرترین جەنگاوەرانی رۆژگاری خۆی بوو. دواتر رووی کردە دێری تەروجە و سەرزەمینی محەممەد کوڕی مەرکەب کوڕی موسا و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر، دواتر رووی کردە لاردە و قەرتاجەنە کەئیسماعیل کوڕی موسا لەوێ بوو. مونزەر تا ئەو کاتەی ملکەچی فەرمانەکان و ناسازگاری گرتەبەر و بارمتەکانی خۆی گەڕاندەوە، درێژەی بەجەنگدا. دواتر رووی کردە ئەنقەرە کە لەدەستی ناباوەڕاندا بوو و چەندین قەڵای ئەو ناوچەی گرت و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەب هێرشی کردە سەر شارۆمەندانی زاب. پێشتر سەرکردەکانی ئەم شارە ڕۆشتبوونە لای ئیبراهیم. ئەو رێزی لێگرتن و خەڵاتی پێ بەخشین و سوار ئەسپی کردن بەڵام دواتر زۆربەی ئەوانی کوشت و تەنانەت لەمناڵەکانیشیان چاوی نەپۆشی و جەنازەکانی فرێدایە ناو چاڵێك.

لەم ساڵەدا کەسێك بەناوی باوکی سور هێرشی کردە سەر سیسیل (سەقەلیە). سوپایەك لەرۆمییەکان رووبەرووی بوونەوە و موسوڵمانان حەوت کەسیان لێ کوژرا و حەسەن کوڕی سیسیل لەسەر کار لابرا و محەممەد کوڕی فەزڵ جێگەی ئەوی گرتەوە و دەستە جەنگاوەرەکانی بۆ هەموو ناوچەکانی سیسیل ڕەوانە کرد و خۆی لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر قەتانییە و زەوییە

کشتوکاڵییەکانی ئەو ناوچەی پێشێل کرد. دواتر روویکردە شەلەندییە و جەنگی لەگەڵ ئەوان ئەزمون کرد و لەکوشتنی ئەوان زێدەڕۆیی کرد. دواتر بەرەو تەبەرمین ئەسپی غاردا و زەوییە کشتوکاڵییەکانی پێشێل کرد. لەم کاتەدا مەبەستی سوپای رۆمی کرد. لەنێوان دوو سوپا جەنگ روویدا و رۆمییەکان شکستیان خوارد و زۆرینەیان کوژران. ژمارەی کوژراوەکان گەیشتە سێ هەزار کەس و سەری ئەوان بۆ بەلەرم ڕەوانە کرا. دواتر موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر قەلایەك کەرۆمییەکان لەو نزیکانە دروستیان کردبوو و بەشاری شەهریار ناویان دەبرد. دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت و جەنگاوەرەکانیان کوشت و دانیشتوانەکەیان گرفتار کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی لەیس هێرشی کردە سەر فارس. فەرمانڕەوای فارس لەم کاتەدا محەممەد کوڕی لەیس بوو. عەمرۆ شکستی پێهێنا و ئوردووگاکەی تالآن کرد بەلآم محەممەد رزگاری بوو و عەمرۆ ڕۆشتە ئیستەخر و تالآنی کرد و کەسانێکی بەشوێن محەممەددا نارد. ئەویان گرت و ئەسیریان کرد. دواتر عەمرۆ مەبەستی شیرازی کرد و لەوێ ئوردووی لێدا.

لەرەبیع الاوەل/ سێپتامبەری ئەم ساڵە بەغداد لەرییەوە. ئەم ئەرد هەژێنە چوار هەورە بروسکەی لەگەڵدا بوو.

لەم ساڵەدا عەباس کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون جەنگی لەگەڵ باوکی کرد. باوکی تا ئەسکەندەرییە شوێنی کەوت و سەرئەنجام ئەوی گرت و گەڕاندییەوە بۆ میسر و خۆی لەگەڵی گەڕایەوە بۆ میسر. پێشتر ئاماژەمان بەبەسەرهاتی ئەواندا.

هەروەها لەم ساڵەدا برای شورکەب هێرشی کردە سەر خوجوستانی و دایکی گرت.

لەم ساڵەدا کوڕی شیبس کوڕی حەسەن شۆڕشی کرد و عومەر کوڕی سیما فەرمانڕەوای حولوانی گرفتار کرد.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی باوکی ئەسبەغ لای عەمرۆ کوڕی لەیس گەڕایەوە. عەمرۆ ئەوی بۆ لای ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف ناردبوو و

ئەحمەد کوڕی باوکی ئەسبەغ، لەگەڵ پارەیەکی زۆر هات و عەمرۆ سێسەد هەزار دینار لەو پارەیەی لەگەڵ پەنجا مەن موشك و پەنجا مەن عەنبەر و دووسەد مەن عود و سێسەد جل و بەرگی بەزێرچنراو و دەفرە زێرین و زیوینەکان و چوارپێکان و بەندەکانی بەبەهای دووسەد هەزار دینار بۆ موەفەق نارد.

لەم ساڵەدا کەیغەلەغ خەلیل کوڕی رەمال وەك فەرمانڕەوای حولوان دەستنیشان کرا. ئەو بارودۆخی لەشارۆمەندانی ئەو دیارەی لەبەر هاوکاری کردنی عومەر کوڕی سیما دژوار کرد و بەگوناحی حەریرە کوڕی شیبس گرفتاری کردن چوونکە ئەوان بەڵێنی ئازادی عومەر و چاککردنی بارودۆخی کوڕی شیبسیان دابوو.

هەروەها لەم ساڵەدا لەنێوان ئەزگوتکین کوڕی ئەسکاتکین و ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف شەڕ روویدا و ئەزکوتکین، شکستی بەئەحمەد هێنا و دەستی بەسەر شاری قومدا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی لەیس سەرکردەیەکی بەفەرمانی باوکی ئەحمەد (موەفەق برای خەلیفە) بۆ لای محەممەد کوڕی عوبەیدالله نارد. ئەو محەممەدی ئەسیر کرد و بردییە لای عەمرۆ.

لەزیقەعدە/ مەی ئەم ساڵە لەشام پیاوێك لەمناڵەکانی عەبدولمەلیك کوڕی ساڵحی هاشمی بەنازناوی بەکار لەنێوان سەلەمییە و حەلەب شۆڕشی کرد و پێشنیاری بەیعەتی باوکی ئەحمەد (برای موعتەمیدی) بەخەڵکان کرد. کوڕی عەباس کەلابی دژی ئەو جەنگی بەڵام شکستی خوارد. دواتر لۆلۆ نوێنەری کوڕی تولون، یوزەری سەرکردەی بەسوپایەك بۆ جەنگی عەبدولمەلیك ڕەوانە کرد و ئەو دەستی عەبدولمەلیکی کورت کردەوە.

لەم ساڵەدا لۆلۆ دژی سەروەری خۆی ئەحمەد کوڕی تولون شۆڕشی کرد.

لەزیحەججە/ جونی ئەم ساڵە ئەحمەد کوڕی عەبدوللەی خوجوستانی بەشمشێری کۆیلەکەی کوژرا.

لەم ساڵەدا هاوەڵانی باوکی ساج، محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەبیبی یەشکوریان لەگوندی واست کوشت و سەریان بردە بەغداد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی زیحەججە/ جون محەممەد کوڕی کەیجور لەگەڵ عەلی کوڕی حسەینی کەفتەمەر جەنگی و کەفتەمەری ئەسیر و دواتر ئازادی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی موغەیرەی مەخزومی هێرشی کردە سەر مەککە. فەرمانڕەوای مەککە لەم کاتەدا هارون کوڕی محەممەدی هاشمی بوو. هارون دەستەیەکی دوو هەزار کەسی کۆکردەوە و خۆڕاگری کرد. مەخزومی ڕۆشتە عەین مەشاش و ئاوی ئەو ناوچەی وشك کرد و خواردەمەنییەکانی جەدەی تاڵان کرد و ماڵی دانیشتوانەکەی سوتاند تا ئەوەی جێگەی چل درهەم نان بەیەك درهەم گەیشت.

لەم ساڵەدا پاشای رۆم ناسراو بەکوڕی سەقەلییە هاتەدەر و لەگەڵ خەڵکانی مەلەتیە جەنگی دەستپێکرد. خەڵکانی مەرعەش و حەدەس هاوکاری دانیشتوانی مەلەتیەیان کرد و پاشای رۆم شکستی خوارد.

- لەم ساڵەدا فەرغانی، کارگوزاری کوڕی تولون لەسنورەکانی شام جەنگی هاوینەی ئەنجامدا و زیاتر لەدە هەزار رۆمی کوشت و سامانی خەڵکی تاڵان کرد و هەر سەربازێك چل دیناری بەرکەوت.

هەروەها لەم ساڵەدا هارون کوڕی محەممەدی ئیسحاقی هاشمی ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و کوڕی باوکی ساج فەرماندەیی پاسەوانەکان و رێگاکانی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی عەبدولحەکەمی بەسری، فەقیهی مالکی، هاورێی شافیعی، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و شەست و نۆی کۆچی ( ٨٨٣ زایینی )

### بەسەرهاتی زەنگییەکان

لەم ساڵەدا تیرێك بەرسینەی موەفەق کەوت. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێك بێهبود دیارنەما، ساحەبی زەنج تەماحی لەسامانەکەی کرد. ئەو دەیزانی سامانی بێهبود دووسەد هەزار دینار لەگەڵ گەوهەر و زیوە. داوای سامانی ئەوی کرد و بنەماڵەکەی گرت و هەموانی ئەشکەنجە و ماڵەکانی وێران کرد بۆ ئەوەی دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت بەڵام هیچی دەست نەکەوت. ئەم کردەوە دڵی هاوەڵانی ئەوی پیس کرد و بەهەڵاتن ناچاری کردن. موەفەق فەرمانیدا لەناو هاوەڵانی بێهبود بانگی بەخشینی ئەمان بەرز بکەنەوە. هاوەڵانی بێهبود بۆ پەیوەست بوون بەموەفەق پێش یەك دەکەوتن و هەرکەس پێش دەکەوت، خەڵاتی وەردەگرت.

لەکاتی هەڵکردنی با و بەرز بوونەوەی شەپۆلەکان، ڕۆشتنی سوپاکەی موەفەق بۆ جەنگی زەنگییەکان دژوار بوو لەبەر ئەمە بڕیاریدا بۆ خۆی و هاوەڵانی لەبەشی ڕۆژئاوا جێگەیەك ئامادە بکات. فەرمانیدا دار خورماکان ببڕنەوە و شوێنێك تەخت و خەندەك و دیواری تیا دروست بکەن بۆ ئەوەی لەهێرشی لەناکاوی زەنگییەکان لەئەماندا بن. کێشکی بۆ سەرکردەکان دیاری کرد تا کرێکاران کارەکەیان تەواو بکەن.

ساحەبی زەنج و هاوەڵانی زانیان ئەگەر موەفەق لێیان نزیك ببێتەوە، دووری ڕێگە بۆ ئەوانەی خوازیاری پەیوەست بوون بەموەفەق و سوپاکەی دەبن، کەم دەبێتەوە و ترس لەناو سوپاکەی دروست دەکات و ئەندێشەکانی بەفیڕۆ دەدات. ساحەبی زەنج بڕیاریدا ڕێگە لەم کارەی موەفەق بگرێت. تا ئەو جێگەی توانی هەوڵەکانی خۆی خستەگەڕ و شەڕێکی ماڵوێرانکەری خستەگەڕ.

لەیەکێك لەڕۆژەکان بایەکی توند هەڵیکرد و سەرکردەیەك لەسەرکردەکانی موەفەق لەوانی دی جیابوویەوە. ساحەبی زەنج ئەم دەرفەتەی بەهەل زانی و

گەمارۆی خستە سەر ئەو سەرکردە و نەهێشت هاوکاری پێ بگات و هەموو سوپاکەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. ئەوان لەگەڵ ئەم سەرکردە جەنگان و شکستیان پێهێنا و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانیان کوشت. کەشتییە جەنگییەکانی موەفەق لەترسی زەنگییەکان و بەردبارانی ئەوان هیچ ڕێگەیەکیان بۆ نزیك بوونەوە لەوان نەدۆزییەوە. بەم شێوەیە زەنگییەکان سەرکەوتن و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ئەسیر کرد و ئەگەر کەسێك رزگاری بوو، خۆی خستە ناو کەشتیەکە و بۆ موەفەقییە گەڕایەوە. ئەم ڕووداوە بۆ سوپاکەی موەفەق دژوار و کارەساتبار بوو.

موەفەق دڵنیابوو بەمانەوەی لەبەشی ڕۆژئاوایی لەفێڵ و فریوی ساحەبی زەنج بەدوور نابێت و ئەوان ئەم دەرفەتە دەقۆزنەوە و ڕێگەی فرت و فێڵ دەگرنەبەر. لەلایەکی دیکە ڕووبەڕووی دژواری ڕێگە دەبێتەوە و زەنگییەکان بۆ ئەم بارودۆخە ئاشناترن و لەهاوەڵانی ئەو بوێرتر. لەبەر ئەمە چاوپۆشی لەو شوێنە کرد و مەبەستی وێران کردنی دیواری ساحەبی زەنج و فراوان کردنی ڕێگە و گوزەرگاکانی کرد و فەرمانیدا لەڕێگەی ڕووباری مەنکی هێرش بکەنە سەر دیوارەکە و بیروخێنن. خۆی لەجەنگەکەدا شمشێری دەوەشاند. شەڕ دژوار و ژمارەیەکی زۆر لەهەر دوو سوپا بریندار بوون. ئەم جەنگە چەند ڕۆژێکی خایاند.

هاوەڵانی موەفەق توانای گوزەر کردن لەدوو پردی ڕووباری مەنکییان نەبوو. بەڵام زەنگییەکان لەکاتی جەنگ لەپردەکە دەپەڕینەوە و لەپشتەوە هێرشیان دەکردە سەر هاوەڵانی موەفەق و برینداریان دەکردن. موەفەق بۆ لەناو بردنی ئەم دوو پردە بیری لەفریوێك کردەوە و فەرمانی بەسوپاکەیدا لەکاتی سەرقاڵی زەنگییەکان و دوور بوونی ئەوان لەکێشك گرتنی ئەم دوو پردە، مەبەستی وێران کردنی بکەن. فەرمانیدا مشار و تەور و کەرەستە پێویستەکان ئامادە بکەن. ئەوان لەنیمەڕۆ ڕوویان کردە پردی یەکەم.. زەنگییەکان هاتن و ڕێگەیان لێ گرتن. جەنگ ڕوویدا و زەنگییەکان شکستیان خوارد. تیرێك لەسینەی فەرماندەی ئەوان باوکی نەدی چەقی و هاوەڵانی موەفەق هەردوو پردەکەیان بڕی و گەڕانەوە.

موەفەق لەجەنگ دژی ساحەبی زەنج پێداگری دەکرد و هاوەڵانی تا ئەو

جێگەی توانیان دیوارەکەیان وێران کرد و ڕۆشتنە ناو شارەکە و گەیشتنە ماڵی کوڕی سەمعان و سلێمان کوڕی جامیع. هەردوو ماڵەکەیان وێران و تاڵان کرد. دواتر روویان کردە بازاری ساحەبی زەنج بەناوی مەیمونە. ئەم بازارەیان لەگەڵ خاك یەکسان کرد. ماڵی حەیاتیان وێران و گەنجەکانی ساحەبی زەنجیان لەو ماڵە تالاًن و ڕفاند. دواتر بەرەو مزگەوتی گەورەی شارەکە بەرێکەوتن تا خاپوری بکەن. زەنگییەکان بەرگرییان لەمزگەوتەکە کرد و دەستی سوپاکەی موەفەق نەگەیشتە مزگەوتەکە چوونکە لەم کاتەدا جەنگاوەر بوێرەکانی ساحەبی زەنج کەهەم بوێر بوون و هەم چاو نەترس، بەدڵ و گیان شمشێریان دەوەشاند و هەرکات یەك لەوان دەکوژرا یا بریندار دەبوو، کەسی تەنیشی ئەوی دەهێنایە دواوە و خۆی جێگەکەی دەگرتەوە.

موەفەق کاتێك ئەمەی بینی، فەرمانی بەباوکی عەباسدا لەگەڵ جەنگاوەرە بوێرەکانی بەرەو پایەکانی مزگەوتەکە بڕوات. دەستەیەك کرێکاری لەگەڵ نارد و فەرمانیدا وێرانی بکەن و پەیژەکان بەرز بکەنەوە. ئەم کارەیان کرد و جەنگێکی سەخت دەستی پێکردەوە و سەرئەنجام سوپاکەی موەفەق خۆیان گەیاندە ئەو شوێنە و وێرانیان کرد و دەستیان بەسەر مینبەرەکەدا گرت و بردیانە لای موەفەق. موەفەق لەسەر وێران کردنی پێداگری دەکرد. هاوەڵانی توانیان دەست بەسەر بەشێك لەگەنجینەی ساحەبی زەنج بگرن. نیشانەکانی سەرکەوتنی موەفەق دەرکەوت و لەم کاتەدا بوو تیرێك لەسینەی چەقی. ئەمە تیری یەکێك لەرۆمییەکانی هاورێی ساحەبی زەنج بەناوی قرتاس بوو. ئەم پێشهاتە لەبیست و پێنجی جومادی الاوەل/ بیست و دووی دێسامبەر روویدا. موەفەق برینداری خۆی شاردەوە و گەڕایەوە بۆ ئوردووگا و شەوی بەسەر برد. لەگەڵ ئازاری ئەم برینەی دووبارە گەڕایەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ تا ورەی سوپاکەی بەهێز بکات بەڵام ناتەوانی ئەو زیادی کرد و بەرادەیەك تەندروستی خراپ بوو کەگومانی مەرگی لێدەکرا.

سوپا و خەڵك ترسیان لێ نیشت و دەستەیەك لەترسا موەفەقییەیان بەجێهێشت و ئەمە فیرۆیی لەفەرمانڕەوایەتی ئەودا دروست کرد. هاوەڵان و کەسە

نزیکەکانی پێشنیاری گەڕانەوە بۆ بەغداد و دانانی جێگریان لەموەفەقییە پێکرد بەلأم رازی نەبوو و ترسا ساحەبی زەنج دووبارە بتوانێت هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوە. بۆ ماوەیەك دوور لەهاوەلأنی دانیشت و دواتر برینەکەی چاك بوویەوە و لەم کاتەدا خۆی نیشانی هاوەلأنی دایەوە و جەنگ دژی ساحەبی زەنجی دەست پێکردەوە. ئەم پێشهاتە لەشەعبان/ فەوریەی ئەم ساڵە روویدا.

## سوتاندنی کۆشکی ساحەبی زەنج

کاتێك برینەکەی موەفەق باش بوویەوە، دووبارە شەڕی لەگەڵ ساحەبی زەنج دەست پێکردەوە. ساحەبی زەنج بەشێك لەکەلێنەکانی دیوارەکەی سەر لەنوێ چاك کردەوە و موەفەق دووبارە ئەوانی وێران کرد.

یەکێك لەرۆژەکان لەکاتی ئێواریێ کەجەنگ لەکەنار رووباری مەنکی بەردەوام و زەنگییەکان کۆببوونەوە و گومانیان دەکرد هێرشی سوپاکەی موەفەق تەنیا لەو جێگەوە دەبێت، موەفەق لەگەڵ کرێکارەکانی (لەلایەکی دیکەی رووبارەکە) لێیان نزیك بوویەوە و جەنگی هەڵگیرساند. کاتێك ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند، موەفەق فەرمانی بەسەرنشینەکانی کەشتییەکاندا بەرەو خوارەوەی رووباری باوکی خەسیب بڕۆن. ئەم شوێنە جەنگاوەری لێ نەبوو. لەم کاتەدا سوپاکەی موەفەق و کرێکارەکان گەیشتن و دیواری ئەم بەشەیان وێران کرد. شەڕکەران پێشڕەویان کرد و رووبارەکەیان بەخوێن سوور کرد و دەستیان بەسەر چەند ماڵ و کۆشکێکی زەنگییەکان گرت و سوتاندیان و تالأنیان کرد و ژمارەیەکی زۆر لەژنەکانیان رزگار و تالأنی زۆریان دەستکەوت.

موەفەق لەکاتی ئاوابوونی هەتاو بێ هیچ زیانێك، وەك سەرکەوتوو گەڕایەوە و دووبارە لەبەرەبەیان، ئاگری شەڕی هەڵگیرساند و بەخێرایی سەرقاڵی وێران کردنی دیوارەکە بوو تا ئەوەی خۆی لەکۆشکەکەی ساحەبی زەنج نزیك کردەوە. کاتێك ساحەبی زەنج هیچ رێگە چارەیەکی نەما، فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەباندا رێگەی دوژمن بگرێت و خەندەك هەڵکەنێت بۆ ئەوەی رێگە لەهاتنە ناوەوەی موەفەق بۆ ناو شارەکە بگرێت. عەلی کوڕی ئەبان ئەو کارەی کرد.موەفەق بەباشی

زانی بۆ پڕکردنەوەی خەندەك و ڕووبار و چاڵەکان هەوڵ بدات. ئەم کارە درێژەی کێشا و سوپای ساحەبی زەنج بەرگرییان کرد. جەنگ بەردەوام و ژمارەیەکی زیاد لەهەردوولا بریندار بوون چوونکە لەیەکەوە نزیك بوون.

کاتێك موەفەق دژواری بارودۆخی بینی، مەبەستی سوتاندنی کۆشکی ساحەبی زەنج و هێرش کردنە سەر کۆشکەکەی کرد. ساحەبی زەنج بەرادەیەك پاسەوان و شەڕکەری بۆ پارێزگاری کردن لەکۆشکەکەی دانا بوو کەئەم کارە بۆ موەفەق دژوار دەهاتە بەرچاو. کاتێك کەشتی لەکۆشکەکە نزیك کەوتەوە، لەکۆشکەوە بارانی تیر دەستی پێکرد و بەردهاوێژەکان بەردیان دەهاویشت. موەفەق فەرمانیدا سایەوان بۆ کەشتییەکان دروست بکەن و بەپێستی گامیش بەهێزی و پارچەی بەدەرمانە جۆراوجۆرەکان چەور کرد تا ڕێگە لەسووتانی کەشتییەکە بگرێت. کاتێك لەم کارە ئاسوودە بوو، فەرمانی بەهاوەڵە شمشێروەشێنەکانیدا خۆیان ئامادە بکەن. نەوت هاوێژەکانیش بەهەمان شێوە.

محەممەد کوڕی سەمعان دەبیری ساحەبی زەنج داوای ئەمانی لەموەفەق کرد. ئەو یەکێك لەبڕاوپێکراوترین هاوەڵانی ساحەبی زەنج بوو. هۆکاری داواکاریەکەی ئەوە بوو ساحەبی زەنج پێی وت مەبەستی ئەوەی هەیە بێ سامان و ماڵ و منداڵ و کۆیلەکانی هەڵبێت و خۆی ڕزگار بکات. کاتێك سەمعان لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە، داوای ئەمانی کرد. موەفەق ئەمانی پێبەخشی و چاکەی لەگەڵ کرد. دەڵێن هۆکاری ئەوەی داوای ئەمانی کرد ئەوە بوو ئەویان ناچار کرد هاودەم و هاونشینی ساحەبی زەنج بێت و ئەمە لەکاتێکدا بوو کەکوڕی سەمعان لەبێ دینی و خراپەکاری ئەو ئاگادار ببوویەوە و تا ئەم ڕۆژە نەیدەتوانی خۆی لەدەستی ئەو ڕزگار بکات. ئەو لەدەی شەعبان/ بیست و سێی فەوریە لەدەستی ساحەبی زەنج ڕزگاری بوو.

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر موەفەق بۆ جەنگی زەنگییەکان خۆی ئامادە و فەرمانی بەباوکی عەباسدا هێرش بکاتە سەر ماڵی محەممەدی کەرنابی. ماڵی ئەو لەبەرابەر کۆشکی ساحەبی زەنج دا بوو. فەرمانی بەباوکی عەباس دا ماڵی ئەو و سەرکردەکانی دیکەی زەنگی بسوتێنێت بۆ ئەوەی نەتوانن بەرگری لەکۆشکەکەی

ساحەبی زەنج بکەن. فەرمانی بەکەشتییەکاندا بۆ سوتاندنی کۆشکەکەی ساحەبی زەنج بەرێکەون. ئەو کارەیان کرد و تا دیواری کۆشکەکەی ڕۆشتنە پێش. هاوەڵانی ساحەبی زەنج ڕووبەڕوویان بوونەوە و بارانی ئاگریان بەسەردا باراندن بەڵام ئاگر زیانی بەکەشتی و سەرنشینەکانی نەگەیاند (چۆنەکە چەور کرابوو) و ئەمە بووە هۆی ئەوەی بتوانن دەست بەسەر کۆشکەکەی ساحەبی زەنج بگرن.

موەفەق فەرمانی گەڕانەوەی بەکەشتییەکاندا و ئەوان گەڕانەوە. ئەو سەرنشینەکانی کەشتی هێنایەخوار وکەسانی دیکەی سوار کەشتییەکان کرد و چاوەڕوانی بەرز بوونەوەی ئاوی دەریایی دەکرد. کاتێك ئاو هاتەسەر، کەشتییەکان بەرەو کۆشکەکەی ساحەبی زەنج گەڕانەوە و ئەو ژوورانەیان سووتاند کەدەیڕوانییە سەر دیجلە. ئاگر کەوتە کۆشکەکەی ساحەبی زەنج و بلاو بوویەوە و سات بەسات زیاتر بڵێسەی دەسەند و ئەمە بووە هۆی ئەوەی ساحەبی زەنج و هاوەڵانی چیتر چاوەڕوان نەبن و چاو لەگەنجینە و سامانەکان بپۆشن. ساحەبی زەنج هەڵات و ئەوەی بووی، بەجێیهێشت.

کۆیلەکانی موەفەق و کەسانی دیکە بەکۆشکەکەی ساحەبی زەنجدا هەڵگەڕان و هەموو شتە گرانبایییەکانیان تالان و ڕفاند و ڕۆشتنە ناو ژوورەکەی خۆی و کوڕەکەی ئەنکلای و هەموو شتێکیان سوتاند. خەڵکان بەگشتی شادومان بوون. ئەوان لەگەڵ سوپاکەی ساحەبی زەنج لەدەرگای کۆشکەکەی شەڕیان کرد و ژمارەیەکیان کوشت و ژمارەیەکیان بریندار و ئەسیر کرد.

باوکی عەباس لەماڵی کەرنابی هاوشێوەی هاوەڵانی خۆی لەکۆشکی ساحەبی زەنج هەموو شتێکی تالان و سوتاند. باوکی عەباس لەم ڕۆژەدا ئەو زنجیرە گەورەی پچڕاند کەساحەبی زەنج بەهۆیەوە ڕووباری باوکی خەسیبی دەبەست بۆ ئەوەی ڕێگە لەهاتنە ناوەوەی کەشتییەکان بگرێت و لەگەڵ خۆی هێنای.

کاتێك هەتاو ئاوا بوو، موەفەق سەرکەوتوو لەگەڵ هاوەڵانی گەڕایەوە. لەو ڕۆژەدا بەلایەك بەسەر کوڕەکەی ساحەبی زەنج هات کەپێشتر بەدەستی ئەو بەسەر موسوڵماناندا هاتبوو. ژنە موسوڵمانەکان ئازاد کران و ئەنکلای بریندار و لەمردن نزیك بوویەوە.

## خنکانی نەسیر

لەرۆژی یەکشەممە بیستی شەعبان/ چواری مارس باوکی حەمزە نەسیر، فەرماندەی کەشتییە جەنگییەکان خنکا.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو موەفەق بەرەبەیان جەنگی دەست پێکرد و فەرمانی بەنەسیردا مەبەستی لەناو بردنی ئەو پردە بکات کە لەسەر رووباری باوکی خەسیب لێدرابوو و نەپرواتە دوو پردەکەی دیکە. موەفەق سوپاکەی خۆی لەچەند ناوچەیەك بلاو کردەوە بەلام نەسیر پەلەی کرد و لەسەرەتای بەرز بوونەوەی ئاو لەگەلّ چەند کەشتییەك رۆشتە ناو رووباری باوکی خەسیب. ئاوی بەرز بوو کەشتیەکەی ئەوی برد. چەند کەشتییەکی دیکەی موەفەق لەگەلّ کۆیلەکان کەموّلەتی چوونە ناو ئاوەکەیان پێ نەبوو، رۆشتنە ناو ئاوەکە و لەگەلّ کەشتیەکەی نەسیر بەریەك کەوتن بەشێوەیەك چیتر مەلەوانەکان نەیاندەتوانی هیچ بکەن.

زەنگییەکان ئەمەیان بینی و لەدوو لای رووبارەکە کۆبوونەوە. مەلەوانەکان لەترسی زەنگییەکان خۆیان خستە ناو ئاوەکە. زەنگییەکان رۆشتنە ناو کەشتییەکانی ئەوان و ژمارەیەك لەجەنگاوەرانیان کوشت و زۆربەیان خنکان. موەفەق لەو رۆژەدا لەگەلّ زەنگییەکان جەنگی و سامانەکانی تالان کرد و مالّەکانی سوتاند.

لەم رۆژەدا سلێمان کوری جامیع جەنگاوەرترینی زەنگییەکان لەجەنگ لەگەلّ موەفەق بوو. لەشوێنەکەی خۆی خۆراگری کرد تا ئەوەی ئەو جەنگاوەرانەی موەفەق کەبۆسەیان نابوویەوە، دەتنەدەر و سلێمان و سوپاکەی بەناچاری هەلاتن. قولاپەی پێی سلێمان بریندار بوو و بەدەمەوە کەوتە سەر سکلّی سور و بەشێکی جەستەی سووتا. هاوەلانی ئەویان رزگار کرد. موەفەق سەرکەوتوو و بێ زیان گەرایەوە بەلام گرفتاری نەخۆشی بوو لەبەر ئەمە لەشەعبان/ فەوریە، رەمەزان، مارس و چەند رۆژ لەشەوال/ ئاوریل چاودێرنی کرد و دەستی لەجەنگی زەنگییەکان هەلّگرت. دواتر باش بوویەوە و فەرمانیدا کەرەستەکانی جەنگ ئامادە بکەن.

## سوتاندنی پردی ساحەبی زەنج

کاتێك موەفەق سەرقاڵی نەخۆشییەکەی خۆی بوو، ساحەبی زەنج ئەو پردەی نەسیر لەنزیك ئەوێ خنکا، سەرلەنوێ نۆژەنی کردەوە و بەهێزتر و قایمتری کرد و چەندین دەکەلی دروست کرد و بەئاسن داپۆشی و پێشەکەی بەبەرد گرت تا رێگەی رۆشتنە ناوەوەی کەشتییەکان رووبەرووی دژواری بکاتەوە و ئاوی رووبارەکە خرۆشان بکات. موەفەق سوپاکەی خۆی کۆکردەو و سوپایەکی بەرەو رۆژهەڵات و سوپایەکی بەرەو رۆژئاوای رووباری باوکی خەسیب رەوانە کرد و کرێکارەکانی لەگەڵ ناردن تا پردەکە وێران بکەن. دواتر فەرمانیدا کەشتییەکان لەقامیش بار بکەن و نەوتی پیا بکەن و بیانخەنە ناو رووبارەکە و فەرمانیدا گڕیان تێ بەردەن تا پردەکە بسوتێنن. سوپاکەی خۆی لەبەرابەر سوپاکەی ساحەبی زەنج بلاْو کردەوە تا رێگەیان نەدا هاوکاری پاسەوانەکانی پردەکە بکەن.

سەربازەکان لەدەی شەوال/ بیست و سێی ئاوریل بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی موەفەق بەرێکەوتن. هەر دوو گروپ روویان کردە پردەکە بەلاْم ئەنکلای کوڕی ساحەبی زەنج و عەلی کوڕی ئەبان و سلێمان کوڕی جامیع رووبەروویان بوونەوە. شەڕ دەستی پێکرد و درێژەی کێشا. ئەم دەستەیە پارێزگارییان لەپردەکە دەکرد چوونکە دەیانزانی وێران بوونی پردەکە چ زیان و دواهاتێکی مەترسیداری بەدواوە دەبێت و لەم کاتەدا گەیشتن بەدوو پردە گەورەکەی دیکە، بۆ موەفەق ئاسانتر دەبێت.

جەنگ لەسەر ئەم پردە تا نیمەڕۆ بەردەوام بوو. لەم کاتەدا کۆیلەکانی موەفەق، سوپاکەی ساحەبی زەنجیان دوورخستەوە و کرێکاران سەرقاڵی برینی پردەکە بوون. ئەم پردە بەرادەیەك بەهێز و قایم بوو کەبڕینی بۆ کرێکارەکان دژوار دەهاتە بەرچاو. لەبەر ئەمە رۆشتنە ناو کەشتییە لێوانلێو لەقامیش و نەوتاوییەکان. گڕیان تێبەردا و لەپردەکەیان نزیك کردەوە و سوتاندیان و بەم شێوەیە بەمەبەستەکەی خۆیان گەیشتن. ژمارەیەکی زۆر لەزەنگییەکانیان کوشت کە لەشوێنی یەکەمی خۆیان پاشەکشێیان کردبوو. ژمارەیەکی زۆری زەنگییەکان

کوژران و ژمارەیەکیان داوای ئەمانیان کرد. هاوەڵانی موەفەق لەپردی ڕۆژئاوا نزیك بوونەوە. موەفەق لەداهاتنی تاریکی ترسا و فەرمانی گەڕانەوەی دەرکرد. سوپا گەڕایەوە. موەفەق نامەی بۆ هەموو شارەکان نووسی تا لەسەر مینبەرەکان جاڕ بدەن هەرکەس لەم جەنگەدا بوێری لەخۆی نیشان بدات، بەهاوتای بوێرییەکەی، ڕۆژانەکەی زیاد دەکرێت. موەفەق ڕۆژی دواتر دوو بورجی بەردینی وێران کرد کەبۆ ڕێگرتن لەهاتوچۆی کەشتییەکان دروست کرابوو. بەوێران کردنی ئەم دوو بورجە هاتوچۆی کەشتییەکان لەناو ئەم ڕووبارە بۆ سوپاکەی موەفەق ئاسان بوویەوە.

## شوێنگۆڕکێی ساحەبی زەنج بۆ بەشی ڕۆژهەڵات و سوتانی بازارەکەی

کاتێك ماڵی هاوەڵانی ساحەبی زەنج سووتا و سامانەکانیان تالآن کرا، ڕوویان کردە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری باوکی خەسیب. ساحەبی زەنج بنەماڵەکەی کۆکردەوە و بازارەکانی گواستەوە. بەم شێوەی هێزی کەمی کرد کەچیتر لای خەڵك شاراوە نەبوو. لەبەر ئەمە چیتر کەس خواردەمەنی بۆ نەدەبرد و بەم شێوەیە ڕێگەی خواردەمەنیی لێگیرا. بەهای نیو مەن نانی گەنم بۆ دە درهەم بەرز بوویەوە و خەڵکان جۆ یا دانەوێڵەی دیکەیان دەخوارد. کار گەیشتە ئەو جێگەی ئەگەر کەسێك هاورێکەی لەسوچێکدا دەبینی، دەیکوشت و گۆشتەکەی دەخوارد. بەهێزەکان ناتەوانەکانیان دەخوارد تا ئەو جێگەی منداڵەکانیش بوونە بەشێك لەخواردنی ڕۆژانەی خەڵك.

موەفەق بەباشی زانی بەشی ڕۆژهەڵات هاوشێوەی ڕۆژئاوا وێران بکات. فەرمانی بەسوپاکەیدا لەگەڵ کرێکاران مەبەستی ماڵی هەمەدانی بکەن. ئەم شوێنە بەژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکان بەرگری لێ دەکرا. بەرد هاوێژ و عارەبانە جەنگییەکان لەم شوێنەدا جێگیر کرابوون. جەنگ دەستی پێکرد و ژمارەی کوژراوەکان فراوان بوون. هاوەڵانی موەفەق سەرکەوتن و پاشەکشێیان بەدوژمن کرد و توانیان بڕۆنە ناو ماڵی هەمەدانی بەڵام لەبەر بەرزی دیوارەکانی سەرکەوتن بۆیان دژوار بوو. ماڵەکەی بەرادەیەك بەرز بوو پەیژەکانیش هیچ کاریگەرییان

نەدەما. دەستەیەك لەكۆیلەكان قولاپیان بۆ ئالأكانی ساحەبی زەنج هاویشت و رایانكێشا. ئالأكان كەوتن و بەم شێوەیە پاسەوانەكانی ماڵەكە دڵنیا بوون لەوەی دەستیان بەسەر ماڵەكەی ساحەبی زەنجدا گرتووە و لەبەر ئەمە هەڵاتن. بەم شێوەیە هاوەڵانی موەفەق دەستیان بەسەر ماڵەكەیدا گرت و نەوت هەڵگرەكان سەركەوتن و گڕیان تێبەردا. بەرد هاوێژ و عارەبانەكانیشیان سوتاند و سامانەكانیان تاڵان كرد و ماڵەكانی تەنیشت ئەو ماڵە، بوونە خۆراكی ئاگر. ژنەكانیان رزگار كرد. ژمارەیەكی زۆری ژنان لەو ماڵەدا دەبینرا. ژنەكانیان بردە موەفەقییە و موەفەق فەرمانیدا رێزیان لێ بگرن و چاكەیان لەگەڵ بكەن.

لەم رۆژەدا ژمارەیەكی زۆر لەهاوەڵانی ساحەبی زەنج و كەسە تایبەتییەكانی داوای ئەمانیان كرد. موەفەق ئەمانی پێ بەخشین و چاكەی لەگەڵ كردن. دەستەیەك لەم كەسانە رێگەی بازارێكی گەورەی ساحەبی زەنجیان نیشاندا كەپەیوەست بەپردی یەكەمەوە بوو بەناوی موبارەكە. ئەوان موەفەقیان ئاگادار كردەوە ئەگەر ئەم بازارە بسوتێت، چیتر بازارێك لەئارادا نابێت و بازرەكان پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئەوان دەپچڕێنن. موەفەق مەبەستی سوتاندنی ئەم بازارەی كرد و فەرمانی بەسوپاكەیدا لەدوو قۆڵەوە هێرش بكەنە سەر ئەم بازارە. سوپاكەی هێرشی كردە سەر بازارەكە و زەنگییەكان رووبەروویان بوونەوە و شەڕێكی قورسیان دەست پێكرد. سوپاكەی موەفەق گەیشتنە سوچێكی بازارەكە و گڕیان تێبەردا و بەم شێوەیە ئاگر بلأو بوویەوە.

دوو سوپا لەناو ئاگردا شمشێریان دەوەشیاند. ئاگر گەیشتە سەقفی بازارەكە و سەقفەكە سووتا و بەسەر جەنگاوەراندا دارما و ژمارەیەكیان سووتان. ئەوان تا ئاوا بوونی خۆر لەسەر جەنگ بەردەوام بوون. لەم كاتەدا دەستیان لەجەنگ هەڵگرت و سوپاكەی موەفەق بۆ ئوردووگاكەیان گەڕانەوە. بازرگانەكان بۆ سەرەوەی شار گوێزرانەوە و لەترسی دووبارە دەست پێكردنەوەی جەنگ بەشێكی زۆری كەل و پەلەكانیان لەم بازارە گواستەوە.

پێش ئەم جەنگە ساحەبی زەنج لەبەشی رۆژهەڵات خەندەكی هەڵكەند و رێگەكانی بەهەمان شێوەی لەبەشی رۆژهەڵات كردبووی، شێواند. خەندەكێكی

لەسەر پانتاییەکان هەڵکەند تا بەهۆیەوە بەرگری لەماڵی هاوەڵانی بکات. موەفەق بەباشی زانی دیواری بەشی رۆژئاوای رووبارەکە بروخێنێت و دوای جەنگێکی درێژخایەن، بەمەبەستەکەی خۆی گەیشت.

لەبەشی رۆژئاوا دەستەیەك لەبوێرترین جەنگاوەرکانی ساحەبی زەنج لەدیوارێکی بەرز سەنگەریان گرتبوو و لەکاتی جەنگ لەحەری کوێر (لەمێژووی تەبەری بەجۆگەی کوێر ناوی هاتووە و راستتر بەرچاو دەکەوێت) و دەوروبەری لەسەنگەرەکان دەهاتنەدەر. موەفەق فەرمانی هێرش کردنە سەر ئەوانی دەرکرد. فەرمانی بەباوکی عەباس و سەرکردەکانی دیکەدا خۆیان ئامادە و پێشڕەوی بکەن. هەروەها فەرمانی بەکەشتییەکاندا لەدیوارەکە نزیك ببنەوە. شەڕ دەستی پێکرد و تا دوای نیمەڕۆ درێژەی کێشا. چەند شوێنێکی دیوارەکە وێران کرا بەڵام هیچ کام لەسوپاکان نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت جگە لەوەی سەرئەنجام سوپاکەی موەفەق توانی دیوارەکە بروخێنێت. هەردوو سوپا زیانی زۆریان لێ کەوت.

موەفەق گەڕایەوە و بەهەر برینداریك بەئەندازەی برینەکەی، پاداشتی بەخشی. لەکاتی جەنگ بەردەوام ئەم کارەی دەکرد. موەفەق دوای جەنگەکە چەند رۆژێك چاوەڕوان بوو، دواتر بەباشی زانی هێرش بکاتە سەر هەمان ناوچە چوونکە شوێنکەی بەبەهێز و جەنگاوەرەانی بەبوێر دەزانی. ئەوەی دەیویست لەحەری کوێر ئەنجامیدا کەپێشتر نەکران دەهاتە بەرچاو. کەرەستەکانی جەنگی ئامادەو سوپاکەی ریزبەندی کرد. رووی کردە ئەو ناوچە و لەگەڵ پاسەوانەکانی جەنگی دەسپێکرد. ئاگری جەنگی قورس هەڵگیرسا و بڵێسەی سەند.

ساحەبی زەنج بەناردنی موهەلبی و سلێمان کوڕی جامیع و سوپاکەیان، هاوکاری پاسەوانەکانی کرد. ئەوان هێرشیان کردە سەر سەربازەکانی موەفەق و تا کەشتییەکان، پاشەکشێیان پێکردن و گیانی دەستەیەکیان گرت. موەفەق بێ ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت، گەڕایەوە. بۆی دەرکەوت دەبوا لەچەند شوێنێکەوە هێرش بکاتە سەر ئەو ناوچە تا لەقورسایی جەنگ لەسەر شانی شەڕکەرەکانی کەم بکاتەوە. ئەو کارەی کرد و سوپاکەی خۆی بەدەوری سوپاکەی

ساحەبی زەنج بلاو کردەوە و خۆی بەرەو رووباری رۆژئاوا بەرێکەوت و شەڕی وەگەر خست. زەنگییەکان بەهۆی جەنگەکەی پێشوو، ورەیان بەرز ببوویەوە. ئەم جارە هاوەڵانی موەفەق بوێرانە جەنگان و بلاوەیان بەدوژمن کرد. زەنگییەکان هەلاتن و قەلاکەیان بەسوپاکەی موەفەق سپارد. سوپاکەی موەفەق ئەوانیان کوشتار و سامانەکانیان تالان و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر و خوێنی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانیان ڕشت و ژنان و منالەکانیان رزگار کرد. موەفەق و سەربازە سەرکەتووەکانی بۆ ئوردووگاکەیان گەڕاندەوە.

## زاڵبوونی موەفەق بەسەر شاری رۆژئاوایی ساحەبی زەنج

کاتێك موەفەق ماڵەکانی ساحەبی زەنجی وێران کرد، فەرمانیدا رێگەکان تەخت بکەن تا رێگە بۆ جەنگاوەران تەخت و بەرین بێت. دواتر بڕیاریدا پردی یەکەمی رووباری باوکی خەسیب وێران بکات چوونکە ئەم پردە رێگر بوو لەناردنی هێزی پشتیوانی زەنگییەکان بۆ یەکتر. فەرمانیدا کەشتییەکەی گەورە لەقامیش بار و نەوتاوی بکەن. دەکەلێکی بەرز لەناو کەشتییەکەدا دابنێن تا کاتێك کەشتی دەگاتە پردەکە لەپردەکە تێپەڕ نەکات. دواتر لەکاتی بەرز بوونەوەی ئاو بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کەشتییەکەی ڕەوانە کرد تا گەیشتە پردەکە. بەلام زەنگییەکان ئاگادار بوونەوە و کەشتییەکەیان بەبەرد و خۆڵ پڕکرد. یەکیان خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە و کونێکی لەکەشتییەکەدا دروست کرد و بەم شێوەیە کەشتییەکەی نەغرۆ بوو. کەمێك لەپردەکە گڕی گرت بەلام زەنگییەکان ئاگرەکەیان کوژاندەوە.

لەم کاتەدا موەفەق مەبەستی پردەکەی کرد و سوپاکەی کۆکردەوە و نەوت هەڵگر و کرێکار و تەور وەشێنەکانی ئامادە و پێی وتن تا بەرەو بەشی رۆژهەلات و رۆژئاوای رووبارەکە پێشڕەوی بکەن. موەفەق خۆی سوار کەشتی بوو و مەبەستی رووباری باوکی خەسیبی کرد. ئەم پێشهاتە لەنیوەی شەوالی ٢٦٩/ بیست و هەشتی ئاوریلی ٨٨٥ زایینی روویدا. دەستەیەك کە بۆ رۆژئاوای رووبارەکە نێردرابوون، پێش کەوتن و پاسەوانەکانی پردەکەیان کەسلێمان کوڕی

جامیع و ئەنكلای كوڕی ساحەبی زەنج، بوون، ناچار بەپاشەكشێ كرد و پردەكەیان سوتان. دواتر دەستەیەكی دیكە هاتن و هەمان بەلایان بەسەر بەشی ڕۆژهەلات هێنا و سوتاندیان و لەوێ گوزەریان كرد و گەیشتنە ناوچەیەك كەبەلەمە جەنگییەكان و كەرەستەكانی ساحەبی زەنجیان لەوێ ئامادە دەكرد. ئەو ناوچەیشیان سەراپا سووتاند و تەنیا چەند بەلەم و كەشتی لەناو ڕووبارەكەدا مایەوە. دواتر ڕوویان كردە زیندانەكەی ساحەبی زەنج و زەنگییەكان بۆ ماوەی یەك كاژێر خۆڕاگرییان كرد. سوپاكەی موەفەق زالبوون و زیندانەكەیان گرت و زیندانییەكانیان ئازاد كرد و تا گەیشتن بەكۆشكی موسلیح، ئەوەی لەسەر ڕێگە بینیان، سووتاندیان و تالانیان كرد. ژن و منالەكانیان ئەسیر و ژمارەیەكی زۆر لەگرفتارانیان ئازاد كرد. موەفەق و سوپاكەی بێ زیان گەڕانەوە.

ساحەبی زەنج و سوپاكەی لێرەوە، بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی ڕووبارەكە ڕۆیشتن و موەفەق دەستی بەسەر بەشی ڕۆژئاوا گرت. تەنیا ڕێگەیەكی كورتی نزیك پردی دووەم لەژێر فەرمانی ئەودا نەبوو. ئەوان ڕێگەكانیان چاك كردەوە و ئەمە ترسی ساحەبی زەنج و سوپاكەی زیاتر كرد. ژمارەیەكی زۆر لەسەرباز و سەركردەكانی ساحەبی زەنج داوای ئەمانیان كرد. ئەمانیان پێبەخشرا و دەستە دەستە بەرەو ئوردووگاكەی موەفەق شۆڕ بوونەوە. موەفەق چاكەی لەگەڵ كردن و بەئەندازەی پێگەی خۆیان، پارەی پێدان.

دواتر موەفەق بڕیاریدا ڕاهێنان بەسەربازەكانی بكات تا بتوانن بۆ سووتاندنی پردەكە لەپردی دووەم تێپەڕن. فەرمانی بەسەربازەكان دەدا كەشتییەكان بخەنە ئاو و مالەكانی نزیك پردەكە بسوتێنن. لەیەكێك لەڕۆژەكان سەركردەیەكی زەنگی لەگەڵ قازییەك، پەنایان بۆ موەفەق برد و ئەمە پشتی ساحەبی زەنجی شكاند. دواتر ساحەبی زەنج لەكەنار پردی دووەم كەسانێكی بۆ پاسەوانی كردنی پردەكە دانا و بەسەربازەكان چواردەوری گرت. موەفەق فەرمانی بەدەستەیەك لەسوپاكەیدا كەشتییەكان لەنزیك پردەكە بسوتێنن. ئەوان كەشتییەكانیان سووتاند. ئەمە بووە هۆی وریا كردنەوەی ساحەبی زەنج و سوپاكەی.

دەستەیەك لەهاوەلانی ساحەبی زەنج لەمالەكانی خۆیان لەنزیك پردی دووەم،

مانەوە. هاوەڵانی موەفەق هێرشیان دەکردنەسەر و ڕێگە شاراوەکانیان دەدۆزییەوە. کاتێك ئەم ڕێگایانەیان دۆزییەوە، مەبەستی سووتاندنی پردی دووەمیان کرد. موەفەق، فەرمانی بەباوکی عەباس و سەرکردەکانی دیکەدا بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستە سوپا برازێننەوە. فەرمانی پێدان لەچەند قۆڵێکەوە هێرش بکەنە سەر پردەکە. تەور وەشێن و نەوت هەڵگر و کەرەستەی جەنگی خستنە بەردەست. خۆیشی لەگەڵ کەشتییەکان ڕۆشتە ناو ڕووبارەکە. کۆیلە هەڵبژێردراوەکانی لەگەڵدا بوون. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند.

لەبەشی ڕۆژئاوا لەبەرابەر باوکی عەباس و هاوەڵانی، ئەنکلای کوڕی ساحەبی زەنج و سلێمان کوڕی جامیع لەبەشی ڕۆژهەڵات لەبەرابەر راشید، کۆیلەی موەفەق و هاوەڵانی ئەو ساحەبی زەنج و موهەلبی و سوپاییەکانی دیکە بوون. جەنگ سێ کاژێر بەردەوام بوو و سەرئەنجام زەنگیەکان هەڵاتن و لەپردەکە نزیك بوونەوە و لەگەڵ پاسەوانە تیرهاوێژەکان جەنگان و ئاگریان لەپردەکە بەردا. سلێمان وئەنکلای لەناو هەڵاتووادا دەبینران. هەردووك بریندار ببوون. ئەو دوانە کاتێك گەیشتنە پردەکە کەئاگری گرتبوو. بەناچاری لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان هەڵدایە ناو ئاوەکە و ژمارەیەکی زۆریان خنکان. ئەنکلای و سلێمان هەڵاتن و پردەکە گری گرت. سوپای موەفەق لەهەر دوو قۆڵەوە لەناو شارەکەی ساحەبی زەنج بڵاو بوویەوە و ژمارەیەکی زۆر لەکۆشك و بازارەکان سووتێنران. کەسانێکی زۆر لەژن و منداڵەکان رزگاریان بوو. سوپاکەی موەفەق ڕۆشتنە ماڵێك کەساحەبی زەنج دوای سووتانی کۆشکەکەی لەوێ دەمایەوە. ئەو ماڵەیشیان سووتاند و سامانەکەیان تاڵان و ساحەبی زەنج هەڵات. بەڵام موەفەق لەو ڕۆژەدا نەیتوانی پارەکانی ساحەبی زەنج بدۆزێتەوە.

لەم ڕۆژەدا ئەو ژنە عەلەوییانەی لەنزیك ماڵەکەی ساحەبی زەنج، زیندانی کرابوون، رزگار کران. موەفەق چاکەی لەگەڵ کردن و لەگەڵ خۆی ئەوانی برد. ئەو زیندانەکانی ساحەبی زەنجی کردەوە و ژمارەیەکی زۆر لەوکەسانەی بەتاوانی نەیاری لەگەڵ ساحەبی زەنج زیندانی کرابوو، ئازادی خۆیان بەدەست هێنایەوە.

موەفەق لەو ڕۆژەدا هەموو بەلەم و کەشتییە بازرگانییە گەورە و بچووکەکان و ئاگر هاوێژەکان و کەشتییەکانی دیکەی لەڕووباری باوکی خەسیبەوە بردە دیجلە. ئەوەی تالانی کردبوو (بەهاکەی بێ ئەژمار بوو) لەناو سوپاییەکان دابەشی کرد.

ئەنکلای کوڕی ساحەبی زەنج لەبەرابەر وەرگرتنی کالاکان ڕازی بوو بەوەی ئەمان لەموەفەق وەربگرێت. موەفەق ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بەلام باوکی لەمەبەستی کوڕەکەی ئاگادار بوویەوە و سەرکۆنەی کرد و لەوەی بیری لێ دەکردەوە، دووری خستەوە. ئەنکلای دووبارە دەستی بۆ شمشێر برد.

سلێمان کوڕی موسای شەعرانی، یەکێك لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج داوای ئەمانی کرد بەلام موەفەق بەهۆی خوێنرێژی وخراپەکارییەکانی رابردووی ئەو ئەمانی پێ نەدا. دواتر ئاگادار بوویەوە دەستەیەك لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج لەرازی نەبوون بەئەمانەکەی سلێمان ترساون (چوونکە ئەوانیش دەیانخواست ئەمان وەربگرن) بەم شێوەیە موەفەق ئەمانی بەموسا بەخشی و کەشتییەکەی بۆ ئەو ناوچەیە نارد کەداوای کردبوو. ئەو لەگەڵ براکەی، بنەماڵەکەی و دەستەیەك لەسەرکردەکان بۆ لای موەفەق بەرێکەوتن. ساحەبی زەنج کەسانێکی نارد تا لەرۆشتنی ئەوان رێگری بکات. موسا جەنگی کرد و سەرئەنجام گەیشتە لای موەفەق. موەفەق بەخششەکانی ئەوی زیاد کرد و فەرمانیدا ئەم کارەی موسا (جەنگ دژی ساحەبی زەنج) بۆ کەسانی دیکە ئاشکرا بکەن تا ئارامی و ئاسوودەی ئەوان زیاتر بکات. هێشتا لەشوێنی خۆیان نەجوولابوون کەدەستەیەك لەسەرکردەکانی زەنگ وەك شیبل کوڕی سالم داوای ئەمانیان کرد و لەلایەن موەفەقەوە پێیان بەخشرا. موەفەق چەند کەشتییەکی بۆ لای شیبل نارد. شیبل و بنەماڵەکەی و دەستەیەك لەسەرکردەکان سوار بوون بەلام ڕووبەڕووی دەستەیەك لەزەنگییەکان بوونەوە و جەنگ دەستی پێکرد و شیبل گەیشتە لای موەفەق. موەفەق ڕێزی گرت و خەلاتی کرد. شیبل لەپشتیوانەکانی ساحەبی زەنج بوو. ئەم کارە (وەرگرتنی ئەمانی شیبل) بۆ سەرکردەکان و ساحەبی زەنج دژوار بوو.

موەفەق کاتێك لەچاکەخوازی و فرەزانی شیبل ئاگادار بوویەوە، بەشێك لەکاروبارەکانی بەو سپارد. شیبل لەشەوێك لەشەوەکان لەگەڵ دەستەیەك

لەزەنگییەکان کەهەموو شوێنەکانی ئۆردووگای ساحەبی زەنجیان دەناسی، هێرشیان کردەسەر زەنگییەکان و ژمارەیەکیان کوشت و ئەسیر کرد و گەڕانەوە. موەفەق پاداشتی پێ بەخشین.

زەنگییەکان دوای ئەم جەنگە چیتر شەوانە نەدەحەوانەوە و لەترسا، بەردەوام چاودێری خۆیان دەکرد. موەفەق بەردەوام دەستە شەڕکەرەکانی بۆ ئۆردووگاکەی ساحەبی زەنج ڕەوانە دەکرد و ڕێگەی فرت و فێڵی دەگرتەبەر و ڕێگەی نەدەدا خواردن و پێداویستییەکانی ژیانیان پێ بگات.

## زاڵبوونی موەفەق بەسەر شاری ڕۆژهەلاتی ساحەبی زەنج

کاتێك موەفەق زانی شوێنکەوتە و سەربازەکانی بەتەواوی شارەزای ئەو سەرزەمینە بوون، بڕیاریدا بۆ جەنگ لەگەڵ ساحەبی زەنج لەبەشی ڕۆژهەلاتی ڕووباری باوکی خەسیب گوزەر بکات. دانیشتنێکی گشتی ڕێکخست و سەرکردە و جەنگاوەرە زەنگییەکان ئەمان بەخشراوەکانی کۆکردەوە. هەموویان لەشوێنێك وەستان تا بەجوانی گوێبیستی وتەکانی بن. موەفەق قسەی کردن و نەزانی و گومڕایی پێشووتری بیرخستنەوە. ئاماژەی بەوەدا ئەمە بووە هۆی ئەوەی کوشتنی ئەوان ڕەوا بێت بەلام ئەو چاوپۆشی لەگوناحەکانیان کرد و پاداشتی کردن و ئەم کارەی ئەوە، شیاوە بەفەرمانبەری کردن وەلامی بدرێتەوە. ئەوەی کەخواوەند تەنیا بەسەرکوت کردنی ساحەبی زەنج ڕازی دەبێت و فەرمانڕەوایی ئەوان سەقامگیر دەکات. وتی ئەوانەی پێچ و کۆلانەکانی شارەکە بەباشی دەناسن و شارەزان، هێرش کردنە سەر ساحەبی زەنج و لەناو بردنی ئەو، ئەرکێکی پێویستی سەرشانی ئەوانە بۆ ئەوەی خواوەند لێیان خۆش ببێت و ئەگەر ئەم کارە بکەن، پاداشتێکی زیاتریان پێ دەبڕێت و هەرکەس کەمتەرخەمی بکات، خۆی بەرپرسیارە.

هەموان دەنگیان بەرز کردەوە و چاکەکاری ئەویان بیرهێنایەوە و خۆیان بەچاکەخواز و گوێڕایەڵ لەقەڵەمدا و وتیان لەم ڕێگەدا خوێنی خۆیان دەبەخشن. ئەوان داوایان لەموەفەق کرد تەنیا ئەوان (زەنگییەکان) بۆ جەنگی سەرکردەکەیان

ڕەوانە بكات تا بەشێوەیەك تۆڵەی لێ بكەنەوە دەرخەری فەرمانبەری و چاكەخوازی ئەوان بێت. موەفەق رازی و وەسفی كردن و مژدەی چاكەی پێدان. فەرمانیدا كەشتییەكان و پردە ڕەوانەكان لەدیجلە و بەتیحە و شوێنەكانی دیكە كۆبكەنەوە تا پەیوەستی سوپاكەی خۆی بكات چوونكە ئەوەی لەبەردەستیدا بوو، بۆ سوپایەكی بەم گەورەییە بەسەندەی نەدەكرد. ئەو كەشتی و بەلەمە جەنگییەكانی ژمارد. ژمارەی ئەو مەلەوانانەی بەئاشكرا لەگەنجینە كەل وپەل و جل و بەرگیان وەرگرت، دە هەزار كەس بوو جیاواز لە مەلەوانەكانی كەشتییە بارهەڵگرەكان كەخواردەمەنییان دەبرد یا خەڵكیان بۆ دابین كردنی نیازەكانیان دەگواستەوە. سەركردەی بەلەمە جەنگییەكان و ئاگرهاوێژەكان و بەلەمەكانی دیكە بەم ژمارەیە زیاد دەكرا.

كاتێك كەشتییەكان ئامادە كران، موەفەق، فەرمانی بەباوكی عەباسی كوڕی و سەركردەكانی دیكەدا لەهەموو لاییەكەوە هێرش بكەنە سەر شاری ڕۆژهەلاّتی ساحەبی زەنج. كورەكەی باوكی عەباسی بۆ كەنارەكانی كۆشكی موهەلبی لەخوارەوەی لەشكرگەكە ڕەوانە كرد. ساحەبی زەنج بەسەرباز و جەنگاوەرەكان ئەو ناوچەی تەنیبوو. باوكی عەباس فەرمانی بەسەربازەكانیدا بەرەو ماڵی ساحەبی زەنج پێشڕەوی بكەن و بیسوتێنن و ئەگەر سەركەوتوو نەبوون، هێرش بكەنە سەر ماڵی موهەلبی. موەفەق لەگەڵ سەد و پەنجا كەشتی جەنگی بەرێكەوت. بەندە هەڵبژێردراوەكانی هاورێیەتیان دەكرد و دە هەزار و سوار و پیادەی لەگەڵدا بوو. موەفەق فەرمانی پێدابوون هەركات بەرەو ڕووبارەكە بەرێكەوت، ئەوانیش بەرێكەون و هەركات وەستا، بێستن تا بەم شێوەی گوێرایەڵی فەرمانەكانی بن.

موەفەق ڕۆژی سێ شەممە هەشتی زیقەعدەی ٢٦٩/ بیستی مەی ٨٨٣ زایینی، لەبەرەبەیاندا بەمەبەستی جەنگ بەرێكەوت. ڕۆژی دووشەممە سوپاكەی موەفەق لەگۆڕەپانی جەنگ بوون. هەردەستەیەك ڕووبەڕووی ئەوكەسانە بوویەوە كەموەفەق فەرمانی پێدابوون. زەنگییەكان ڕووبەڕوویان بوونەوە و ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند. ژمارەیەكی فراوان لەهەردوو سوپا كوژران و بریندار بوون. خراپەكاران

بەهەموو هێزیانەوە بەرگرییان لەسنوورەکەی خۆیان دەکرد وگیانیان دەبەخشی و خۆڕاگرییان کردە پیشە بەڵام سەرئەنجام سەرکەوتن بەموەفەق و سوپاکەی بڕا و زەنگییەکان هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و دەستەیەکی فراوان لەجەنگاوەرەکانیان ئەسیر کران. موەفەق فەرمانی سەربڕینی گیراوەکانی لەناو گۆڕەپانەکە دەرکرد و هەموویان هێرشیان کردە سەر ئەوماڵەی ساحەبی زەنج خۆی تیا حەشاردابوو. ساحەبی زەنج پاڵەوانەکانی بۆ بەرگری کردن لەماڵەکەی کۆکردەوە بەڵام سوودیان پێ نەگەیاند و هەڵاتن و ماڵەکەیان بەموەفەق سپارد. سوپاکەی موەفەق ڕۆشتنە ناو ماڵەکە. هێشتا بڕێك لەسامان وکەل و پەلەکان لەناو ماڵەکەدا دەبینرا. سوپاکەی موەفەق دەستیان بەتالانی کرد و ژن و منداڵەکانیان ئەسیر کرد. ژمارەی کوڕ و کچەکانی بیست کەس بوو. ساحەبی زەنج بەرەو ماڵی موهەلبی هەڵات گرنگی بەسامان و بنەماڵەکەی نەدا. ماڵەکەی سوتا و ژن و منداڵەکەیان بردە لای موەفەق و ئەو، ئەوانی ڕەوانەی بەغداد کرد.

ژمارەیەك لەهاوەڵانی باوکی عەباس پێشتر هێرشیان کردبووە سەر ماڵی موهەلبی. کاتێك گەیشتنی ئەوان، ژمارەیەکی زۆر لەهەڵاتووان پەنایان بۆ ئەو ماڵە بردبوو. هاوەڵانی عەباس ئەوانیان کوشتار و تالان کردنیان کردە پیشە و ناموس و منداڵی موسوڵمانەکانیان هەڵدەگرت و ئەوەی دەستیان دەکەوت، دەیانبردە ناو کەشتییەکان. دەستەیەك بەدەرگا و دیواری ماڵەکەدا هەڵگەڕان و کاتێك زەنگییەکان ئەوانیان بینی، گەڕانەوە و ژمارەیەکیان لێ کوشتن.

دەستەیەك لەبەندەکانی موەفەق کەمەبەستی ماڵی ساحەبی زەنجیان کردبوو، سەرقاڵی بردنی تالانییەکان بۆ ناو کەشتییەکان بوون. زەنگییەکان ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە و هێرشیان کردنەسەر و شکستیان پێهێنان و شوێنیان کەوتن. ژمارەیەك لەجەنگاوەرە بوێرەکانی موەفەق خۆڕاگرییان کرد و زەنگییەکانیان دوور خستەوە و بەم شێوەیە سەربازەکان کەمێك ئاسوودە بوون. جەنگ تا دەمەوئێواری بەردەوام بوو. موەفەق فەرمانی بەبەندەکانیدا بەهەموو هێزیانەوە هێرش ببەن. ئەو کارەیان کرد و ساحەبی زەنج و هاوەڵانی هەڵاتن. شمشێرەکان بەرز کرانەوە تا ئەوەی گەیشتنە ماڵی ساحەبی زەنج.

لەم کاتەدا موەفەق بەباشی زانی دڵنەوایی سوپاکەی بکات، ئەوانەی تاڵانییان بەدەست هێنابوو، گەڕاندەوە. دەستەیەك لەژنە ئەسیرەکانیان بۆ موەفەقییە برد.

باوکی عەباس لەو ڕۆژەدا یەکێك لەسەرکردەکانی خۆی نارد و ئەو، ئاگری بەردایە خەرمانەکانی ساحەبی زەنج. ئەم کارە ساحەبی زەنج و هاوەڵانی ئەوی لاواز کرد. لەم کاتەدا موەفەق نامەیەکی لەلۆلۆ کۆیلەی کوڕی تولون بەدەست گەیشت کەبۆ لای ئەو بەرێکەوتووە. موەفەق تا گەیشتنی ئەو جەنگی دوا خست.

## ناسازگاری لۆلۆ لەگەڵ سەروەرەکەی ئەحمەد کوڕی تولون

لەم ساڵەدا لۆلۆ کۆیلەی ئەحمەد کوڕی تولون، فەرمانڕەوای مسر، دژی سەروەری خۆی راپەڕی. حیمس، قێنسرین، حەلەب، سەرزەمینی موزێر لەجەزیرە لەژێر فەرمانی ئەودا بوو. ڕووی کردە بالیس و ئەو شارەی تاڵان کرد. نامەیەکی بۆ موەفەق نووسی و مەرجی دانا. باوکی ئەحمەد بەمەرجەکان رازی بوو. لۆلۆ کە لەڕەققە بوو، بۆ پەیوەست بوون بەموەفەق بەرێکەوت و لەقێرقیسیا ئوردووی لێدا. کارگوزاری ئەم شارە کوڕی سەفوانی عوقەیلی بوو. لۆلۆ بەجەنگ ڕووبەڕووی بوویەوە ودەستی بەسەر شارەکەدا گرت و بەئەحمەد کوڕی مالك کوڕی تەوقی سپارد و بۆ پەیوەست بوون بەموەفەق بەرێکەوت.

## بەرێکەوتنی موعتەمید بۆ شام و گەڕانەوەی ئەو لەنیوەی ڕێگە

لەم ساڵەدا موعتەمیدی خەلیفە بەرەو میسر بەرێکەوت. هۆکاری ڕۆشتنەکەی ئەوە بوو لەخەلافەت تەنیا ناوەکەی بۆ ئەو مابوویەوە و کەس فەرمانەکانی ئەوی جێبەجێ نەدەکرد و واژۆی ئەو گرنگی پێ نەدەدرا و کارەکان لەسەر دەستی موەفەق سامان دەدران و باجەکان ڕەوانەی بارەگای ئەو دەکران. موعتەمید لەم بارودۆخە نارازی بوو و بەنەنگی دەزانی. ئەحمەد کوڕی تولون ئامۆژگاری کرد تا لەمیسر پەیوەستی ئەو ببێت و بەڵێنی هاوکاری پێدا. ئەو سوپایەکی بۆ ڕەققە ...رد تا پێشوازی لەخەلیفە بکەن. موعتەمید ئامادە نەبوونی موەفەقی بەدەرفەت

زانی و لەجومادی الاوەل/ نۆڤەمبەر لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان بەرێکەوت و لەکوحەیل ئوردووی لێدا و سەرقاڵی راو کردن بوو.

کاتێك موعتەمید گەیشتە سنوری ئیسحاق کوڕی کونداجیق فەرمانڕەوای موسڵ و هەموو جەزیرە، کونداجیق سەرکردەکانی هاوڕێی موعتەمیدی گرت کەنەیزەك و ئەحمەد کوڕی خاقان و خەتارمیش بوون و سامان و چوارپێکانی ئەوانی تالان کرد. ساعید کوڕی مەخلەد وەزیری موەفەق ئەم فەرمانەی بۆ نووسیبوو. چۆنیەتی رۆیشتنی ئەوان بۆ سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو بەمشێوە بوو کەساعید وای نیشان دەدا هاوڕێ لەگەڵ ئەوان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی موعتەمیدە چوونکە خەلیفەیە. کاتێك گەیشتنە سنووری ئەو، چەند مەنزڵێك لەگەڵ ئەوان ڕۆشت و کاتێك لەسنووری دەسەڵاتی کوڕی تولون نزیك بوونەوە، شوێنکەوتەکان، بەندەکان و سەرکردەکانی هاوڕێی موعتەمید ڕۆشتن بەڵام کونداجیق لەڕۆشتنی سەرکردەکان ڕێگری کرد و لەلای موعتەمید لەگەڵ ئەوان کۆبوویەوە و وتی: هەنووکە لەسنوری فەرمانڕەوایەتی کوڕی تولوندان و فەرمان، فەرمانی ئەوە و ئێوە لەریزی سوپاکەی ئەو هەژمار دەکرێن، هەنووکە لەگەڵ ئەوەی دەزانن ئەو کەسێکە وەك ئێوە ئایا رازین ملکەچی فەرمانەکانی بن؟ وتووێژی نێوان ئەوان تا نیمەڕۆ درێژەی کێشا و موعتەمید و هاوەڵانی لەشوێنەکەی خۆیان نەجووڵان. کوڕی کونداجیق وتی: هەستن تا بەئامادە بوونی سەروەری باوەڕداران درێژە بەم گفتوگۆیە نەدەین. دەستی سەرکردەکانی گرت و ئەوانی بردە خێوەتەکەی خۆی چوونکە خێوەتی سەرکردەکان پێشتر بۆ لای کوڕی تولون ڕەوانە کرابوو. کاتێك ڕۆشتنە ناو خێوەتەکەی، ئەوانی قۆڵبەست کرد. کاتێك لەقۆڵبەست کردنی ئەوان ئاسوودە بوو، هاتە لای موعتەمید و ئەوی بۆ بەجێهێشتنی سەرزەمینی باو و باپیرانی سەرکۆنە کرد. هەروەها بۆ ئەوەی دەبێت موەفەقی برای لەجەنگی ئەو کەسانەی خوازیاری مەرگی خۆی و بنەماڵەکەین، پشتگوێ بخات. بەم شێوەیە ئەوانی بۆ سامەرا گەڕاندەوە.

## جەنگی سوپای تولون و سوپای موەفەق لەمەككە

لەزیقەعدە/ مەی ئەم ساڵە، لەنێوان سوپای ئەحمەد كوڕی تولون و سوپای موەفەق لەمەككە شەڕ روویدا.

چۆنیەتییەكەی بەم شێوە بوو ئەحمەد كوڕی تولون سوپایەكی لەگەڵ دوو سەركردە بۆ مەككە ڕەوانە كرد. ئەم دەستەیە كاتێك گەیشتنە مەككە، گەنم فرۆش و قەسابەكانیان كۆكردەوە و بڕێك پارەیان لەناودا دابەش كردن. فەرمانڕەوای مەككە هارون كوڕی محەممەد لەو كاتەدا لەترسی ئەم سوپایە ڕۆشتبووە باخی كوڕی عامر. لەزیحەججە/ جونی ئەم ساڵە جەعفەری ناعەمودی، لەگەڵ سوپایەك (لەلایەن موەفەقەوە) هاتە مەككە و هارون كوڕی محەممەد بۆ سەردانی ڕۆشت و جەعفەر پشتیوانی خۆی بۆ دەربڕی. ئەم سوپایە رووبەرووی سوپاكەی كوڕی تولون بوویەوە. خەڵكانی خوراسان هاوكاری جەعفەریان كرد. دووسەد كەس لەسەربازەكانی كوڕی تولون كوژران و كەسانی دیكە هەڵاتن و سامانەكەیان تاڵان كرا. جەعفەر لەم دوو سەركردە دووسەد هەزار دیناری وەرگرت و ئەمانی بەگەنم فرۆش و قەسابەكان بەخشی. لەمزگەوتی هەینی نفرین نامەیەك بۆ كوڕی تولون خوێنرایەوە. لەم جەنگەدا زیان لەخەڵك و كاڵای بازرگانەكان نەگەیشت.

## بیركردنەوەی چەند رووداوێك

لەموحەرەم/ جولای ئەم ساڵە عەرەبە دەشتەكییەكان لەنێوان سور و سەمیرا رێگەیان لەحاجییەكان گرت و سامانەكانیان تاڵان كرد. رێگرەكان پێنج هەزار وشتر و بارەكانیان فڕاند و خەڵكانێكی زۆریان گرفتار كرد.

لەم ساڵەدا مانگ گیرا تا ئەوەی خۆر دەركەوت و جارێكی دیكە خۆر گیرا تا ئەو جێگەی مانگ دەركەوت. لەموحەرەم/ جولای ئەم ساڵە دوو جار مانگ گیران و خۆرگیران روویدا.

لەسەفەر/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە خەڵكی گەڕەك و كۆڵانەكانی بەغداد دژی

ئیبراهیمی خەلیجی راپەڕین و ماڵەکەیان تاڵان کرد. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو یەکێك لەبەندەکانی بەتیر ژنێکی کوشت. خەڵك سکاڵایان بۆ لای ئیبراهیم بەرز کردەوە بەڵام ئەو بەتوندی وەڵامی دانەوە و بەندەکانی خەڵکیان کردە نیشانەی تیرەکانی خۆیان و ژمارەیەکیان بریندار کرد. خەڵکان شۆڕشیان کرد و دووان لەکەسەکانی ئەویان کوشت و ماڵ و چوارپێکانیان تاڵان کرد. ئەو لەشارەکە هەڵات. محەممەد کوڕی عوبەیداللە کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر کە لەلایەن باوکی سەرۆکی ئاسایشی شارەکە بوو، سامان و چوارپێکانی ئەوی کۆکردەوە و بۆی گەڕاندەوە.

لەم ساڵەدا دوای گەڕانەوەی باوکی ساج لەمەککە، سوپایەك بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرا و ئەو ڕێگەی جەددەی گرتەبەر و لەمەخزومی یاخی بڕێك سامان و کەل و پەلی جەنگی وەرگرت.

لەم ساڵەدا خەلەف نوێنەری ئەحمەد کوڕی تولون لەسنورەکانی شام ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. سنورداری ئەو ناوچەیە بازماری بەندە، موالی موفلیح کوڕی خاقان بوو. ئەو بازماری زیندانی کرد بەڵام دەستەیەك لەسنورنشینەکان هێرشیان کرد و ئەویان لەزیندان هێنایەدەر و خەلەف هەڵات و خەڵکانی ئەم سنورە چیتر بەناوی کوڕی تولون وتاریان نەدەخوێندەوە. کوڕی تولون هێرشی کردەسەریان و لەئەزەنە ئوردووی لێدا. خەڵکانی تەرسوس کە لەگەڵ بازمار لەوێ سەنگەریان گرتبوو، ڕێگەیان لێگرت. کوڕی تولون گەڕایەوە و ڕوویکردە حیمس و لەوێوە بۆ دیمەشق و لەو شارە مایەوە.

لەم ساڵەدا رافیع کوڕی هەرسیمە دژی خوجوستانی، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە چوونکە دەستی بەسەر شارەکانی خوراساندا گرتبوو و زیاتر لەدەساڵ لەئاوەدانییەکانی خوراسان باجی کۆدەکردەوە تا ئەو جێگەی خەڵکەکەی هەژار کرد و ئەو کەنارانەی وێران کرد.

لەم ساڵەدا حەسەنییەکان و حسەینییەکان لەلایەك و جەعفەرییەکان (منداڵەکانی جەعفەری تەیار برای عەلی) لەلایەکی دیکە لەحیجاز جەنگ ڕوویدا و هەشت کەس لەجەعفەرییەکان کوژران. حەسەنییەکان و حسەینییەکان، فەزڵ کوڕی عەباسی

عەباسی، فەرمانڕەوای مەدینەیان رزگار کرد.

لەجومادی الاخرە/ دێسامبەری ئەم ساڵە هارون کوڕی موەفەق ئەنبار ورێگەی فورات و رەحبەی بەباوکی ساج سپارد و محەممەد کوڕی ئەحمەد وەك فەرمانڕەوای کوفە و دەوروبەری دەستنیشان کرد. محەممەد لەگەڵ هەیسەمی عیجیل جەنگی و سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لەم ساڵەدا عیسا کوڕی شێخ کوڕی شەلیلی شەیبانی کە فەرمانڕەوایەتی ئەرمەنستان و دیاربەکری دەکرد، مرد.

لەم ساڵەدا موعتەمید، کوڕی تولونی لەماڵی گشتی (دارەئلعامە) نفرین کرد و فەرمانیدا لەسەر مینبەرەکان نفرینی بکەن. ئەو ئیسحاق کوڕی کونداجیقی وەك فرمانڕەوای سنورەکانی ژێر دەسەلاتی کوڕی تولون دیاریکرد و لەدەروازەی شەماسییە تا ئەفریقییەی بەو سپارد و سەرۆکایەتی ئاسایشی خستە ئەستۆی ئەو. هۆکاری نفرین کردنی کوڕی تولون ئەوە بوو کوڕی تولون چیتر بەناوی موەفەقەوە وتاری نەدەخوێند وناوی ئەوی سڕییەوە. موەفەق، فەرمانی بەموعتەمید دا نفرینی بکات. موعتەمید بەناچاری ئەو کارەی کرد چوونکە لەدڵەوە کوڕی تولونی خۆش دەویست.

لەم ساڵەدا لەنێوان باوکی ساج و عەرەبە دەشتەکییەکان جەنگ روویدا. دەشتەکییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەڵام ئەو بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردنەسەر و دەستەیەکی کوشت و ئەسیر کرد و سەرە بڕاوەکان و بەند کراوەکانی بۆ بەغداد نارد.

لەشەوال/ ئاوریلی ئەم ساڵە، باوکی ساج ڕۆشتە رەحەبی مالك کوڕی تەوق. ئەمە دوای ئەوە بوو لەگەڵ دانیشتوانەکەی جەنگا و خوێنی دەستەیەکی لەوان ڕشت. ئەحمەد کوڕی تەوق بۆ شام هەڵات. دواتر باوکی ساج ڕۆشتە ناو قرقیسیا.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاقی هاشمی لەم ساڵەدا ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی فەزڵ، فەرمانڕەوای سیسیل، لەگەڵ سوپایەك هێرشی کردە سەر کەنارەکانی رەمتە. سوپاکەی گەیشتە قەتانییە و ژمارەیەکی

زۆر لەرۆمییەکانی کوشت و دەستەیەکی ئەسیر کرد و ئەوەی بینی، فڕانی و تالآنی کرد. لەزیحەججە/ جون بۆ بەلەرم گەڕایەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی موخالید، موالی موعتەسەم، لەبانگەشەکەران بۆ موعتەزیلە، مرد. ئەو زانستی کەلام لەجەعفەر کوڕی موبەشیر فێر ببوو.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی حەفس کوڕی باوکی عوسفوری ئەفریقی (شوێنکەوتەی بیروباوەڕی موعتەزیلە) مرد. ئەو باوەڕی بەئافرێنراو بوونی ناوی خواوەند هەبوو. بۆ بلآو کردنەوەی بیروباوەڕەکەی خۆی ڕێگەی قیروانی گرتەبەر بەلآم سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و لەگەڵ بیشری مەریسی و باوکی هوزەیل و شوێنکەوتەکانی دیکەی خەواریج یەکیان گرت.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتای کۆچی (٨٨٣و٨٨٤ زایینی)

### چۆنیەتی کوژرانی ساحەبی زەنج

چۆنیەتی جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان و گەڕانەوەی سەرکەوتووانەی موەفەقمان باس کرد. کاتێك موەفەق دوای جەنگ بۆ موەفەقییە گەڕایەوە، بڕیاریدا دەست لەجەنگ لەگەڵ زەنگییەکان هەڵگرێت. لەم کاتەدا نامەی لۆلۆ، کۆیلەی کوڕی تولونی بەدەست گەیشت کەمۆڵەتی دەویست تا پەیوەستی ببێت. موەفەق مۆڵەتی پێدا و جەنگی تا گەیشتنی لۆلۆ دواخست بۆ ئەوەی دوای پەیوەست بوونی ئەو درێژە بەجەنگ بدات. لۆلۆ بەسوپایەکی گەورە لەسێی موحەرەم/ چواردەی جۆلای هاتە لای موەفەق. موەفەق ڕێزی لێگرت و پێشوازی لێکرد. دیاری بەخۆی و هاوەڵانی بەخشی و فەرمانیدا هەرکەس بەئەندازەی پێگەی خۆی، ڕۆژانەی پێ بدرێت. ڕۆژانەی ئەوانی زیاد کرد. دواتر فەرمانی بەلۆلۆدا بۆ جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان سوپا برازێنێتەوە. ساحەبی زەنج کاتێك لەڕووباری باوکی خەسیب شکستی خوارد و پردەکان پچڕان، لەدوو لای ئەم ڕووبارە بەنداوێکی بەست و لەناوەڕاستی ڕووبارەکە دەلاقەیەکی دروست کرد تا ئاوی ڕووبارەکە بەشێوەیەکی خرۆشان ڕەوان ببێت. بەم شێوەیە هاتنە ناوەوەی کەشتییەکان لەکاتی هاتنە ناوەوەی کەشتییەکان و چوونە دەرەوەیان لەکاتی بەرز بوونەوەی ئاو ئەگەری نەبوو. موەفەق دڵنیابوو لەوەی ڕەوان بوونی ئەم ئاوە تەنیا بەوێران کردنی ئەم بەنداوە ئەگەری دەبێت. موەفەق مەبەستی ئەنجامدانی ئەو کارەی کرد بەڵام زەنگییەکان سەرسەختانە بەرگرییان کرد و هەر ڕۆژ سوپایەکی زیاتریان بۆ ئەو ناوچەیە دەنارد. ئەم بەنداوە لەناو ماڵەکانی ئەواندا بوو و کاری بەرگری کردنی بۆ ئەوان ئاسان دەکرد. هەرکەس مەبەستی وێران کردنی بەنداوەکەی دەکرد، ڕووبەڕووی دژواری دەبوویەوە.

موەفەق جەنگی دەست پێکرد و دەستە دەستە لەهێزەکانی لۆلۆی ڕەوانە دەکرد تا جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان ئەزموون بکەن و شارەزای شوێنەکان بن.

موەفەق فەرمانی بەلۆلۆدا لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی بۆ جەنگ و وێران كردنی ئەم بەنداوە خۆی ئامادە بكەن. لۆلۆ ئەم كارەی كرد. موەفەق بەبوێری لۆلۆ و سوپاكەی شادمان بوو. لەرووی خۆشەویستی فەرمانی گەڕانەوەی بەلۆلۆ و سوپاكەیدا و خەڵاتی كردن.

موەفەق بۆ وێران كردنی ئەم بەنداوە پێداگری دەكرد و لەگەڵ سەربازەكانی خۆی و لۆلۆ و كەسانیتر لەگەڵ زەنگییەكان دەجەنگان. كرێكارەكان هەوڵیان دەدا بەنداوەكە بڕوخێنن. لەچەند لایەكەوە هێرشیان كردە سەر زەنگیەكان و ماڵەكانیان سووتاند و شەڕكەرانیان دەكوشت. دەستەیەك داوای ئەمانیان لەموەفەق كرد. بۆ ساحەبی زەنج و هاوەڵانی لەزەوییەكانی كەناری رووباری رۆژئاوا تەنیا چەند كێڵگە و قەڵا و دوو پرد مابوویەوە و دەستەیەك پارێزگارییان لێدەكرد. باوكی عەباس بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێكەوت و سوپاكەی خۆی بڵاوە كردەوە و چەندین بۆسەی نایەوە. دواتر هێرشی كردە سەریان و بەهەڵاتن ناچاری كردن. ئەوان بۆ هەر شوێنێك هەڵدەهاتن، ئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، دەهاتنەدەر و رووبەroویان دەبوونەوە و هەموویان كوشت و جگە لەوانەی ئاوارە بوون، كەس رزگاری نەبوو. سەربازەكانی باوكی عەباس ئەو دوو پردەیشان وێران كرد. موەفەق هێشتا سەرقاڵی جەنگ لەبەنداوەكەی رووباری باوكی خەسیب بوو و سەرئەنجام كەلێنێكی تیا دروست كرد.

كاتێك موەفەق كۆتایی بەكاری بەنداوەكە هێنا، مەبەستی هێرش كردنە سەر ساحەبی زەنجی كرد و فەرمانیدا كەشتییەكان و كەرەستەكان بۆ جەنگ لەئاو و وشكانی ئامادە بكەن. ئەو فەرمانی بەباوكی عەباسی كوڕیدا لەلای كۆشكی موهەلبییەوە هێرش بكاتە سەر ساحەبی زەنج و سوپاكەی لەهەموو شوێنێك بڵاوە پێبكات. ئەمان بەخشراوەكانی لەگەڵ شیبل ڕەوانە كرد و فەرمانی پێدان بوێرانە رووبەرووی سوپاكەی ساحەبی زەنج ببنەوە. موەفەق فەرمانی بەهەمواندا پێش شەكانەوەی ئاڵای ڕەش لەسەر ماڵی كرمانی و فوو كردن بەكەڕەنا كەدەنگەكەی لەدوورەوە دەبیسترا، كەس هێرش نەكاتە سەر هیچ شوێنێك.

ئەو لەرۆژی دووشەممە سێی موحەرەم/ چواردەی جۆلای بەرێكەوت، بەلاخ

خەڵکان چاوەڕوان نەبوون و هێرشیان کردە سەر زەنگییەکان. زەنگییەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە و دەستەیەك لەوانیان کوشتار و دووریان خستنەوە. سوپاییەکانی دیکە لەبەر زۆری و دوور بوونیان لەیەکتر لەم پاشەکشێیە ئاگادار نەبوون. لەم کاتەدا موەفەق فەرمانیدا ئاڵای ڕەش بشەکێننەوە و فوو بەکەڕەنادا بکەن. بەم شێوەیە سوپا لەوشکانی و ئاو بەرێکەوت. زەنگییەکان کەهێزی خۆیان کۆکردبوویەوە و لەسەرکەوتنی پێشووی خۆیان بەسەر سوپاکەی موەفەق ورەیان بەرز ببوویەوە، ڕووبەڕووی سوپاکەی موەفەق بوونەوە. سوپاکەی موەفەق بوێرانە هێرشیان کردە سەر دوژمن و شەڕێکیماڵوێرانکەر دەستی پێکرد. ژمارەیەکی زۆر لەهەردوولا کوژران و سەرئەنجام سوپاکەی ساحەبی زەنج شکستی خوارد و سەربازەکانی موەفەق شوێنیان کەوتن و گرفتاریان کردن. سوپاکەی موەفەق لەم ڕۆژەدا ڕووبەڕووی سوپای دوژمن بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت کە لەژماردن نایەت. بەم ژمارەیە لەزەنگییەکان لەناو ئاودا خنکان. موەفەق بەتەواوی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و سوپاکەی تالاّنیان کردە پیشە و ژن و منداڵە ئەسیرەکانیان ئازاد کرد. بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبانی موهەلبی و دوو براکەی ئەو خەلیل و محەممەد و منداڵەکانی ئەم دوانەیان گرت و ڕەوانەی موەفەقییان کردن.

ساحەبی زەنج لەگەڵ هاوەڵانی، کوڕەکەی ئەنکلای، سلێمان کوڕی جامیع و چەندین سەرکردە لەزەنگییەکان بۆ شوێنێك هەڵاتن کەساحەبی زەنج پێشتر ئامادەی کردبوو تا لەئەگەری هەڵاتن بۆ ئەو ناوچەیە پەنا ببات. ئەم جێگە لەکەناری ڕووبارێك بەناوی سوفیانی بوو. سوپاکەی موەفەق لەتالاّن کردن و سوتاندن بەردەوام بوو. موەفەق فەرمانی بەکەشتییەکاندا بەرەو ڕووباری سوفیانی بەرێکەون. لۆلۆ و هاوەڵانی دیکەی موەفەق هاوڕێیەتیان دەکرد. هاوەڵانی موەفەق گومانیان دەکرد ئەو بۆ شار موەفەقییە گەڕاوەتەوە. ئەوانیش بەکەشتییە لێوانلێو لەتالاّنییەکان گەڕانەوە. موەفەق و هاوەڵانی گەیشتنە ئوردووگاکەی ساحەبی زەنج و ئەمە لەکاتێکدا بوو ئەوان هێشتا لەهەڵاتن بەردەوام بوون. لۆلۆ و سوپاکەی شوێنیان کەوت و گەیشتنە ڕووبارێك بەناوی فێرەبری. دانیشتوانی ئەم کەنارە خۆیان بەلۆلۆ و سەربازەکانی گەیاند. لۆلۆ شکستی پێهێنان و لەڕووباری

سوفیانی گوزەری کرد. لۆلۆ شوێن هەڵاتوان کەوت. هەڵاتوان پەنایان بۆ کێوێك لەپشت ئەم رووبارە برد و لۆلۆ و سوپاکەی بەتەنیایی شوێنیان کەوتن. رۆژ بەرەو کۆتایی دەڕۆشت. موەفەق فەرمانی گەڕانەوەی پێدا و ئەو چاکەکار و بەناوبانگ، گەڕایەوە. موەفەق ئەوی لەگەڵ خۆی برد و دووبارە خەڵاتی کرد. کاتێك موەفەق گەڕایەوە، کەسی لەناو شاری زەنگییەکاندا نەبینی، لەبەر ئەمە بۆ شارەکەی خۆی، موەفەقییە گەڕایەوە و هەواڵی گرتن و هەڵاتنی زەنگییەکان و سەرکردەی ئەوانی بەخەڵکاندا.

موەفەق لەبەر سەرپێچی کردنی سوپاکەی لەفەرمانەکانی، توڕە بوو چوونکە لەو شوێنەی فەرمانی پێدابوون، چاوەڕوانیان نەکرد. هەموویانی کۆکردەوە و سەرکۆنەی کردن و بەتوندی لەگەڵیان ئاخاوت. ئەوان داوای لێخۆشبوونیان لەموەفەق کرد چوونکە گومانیان کردبوو ئەو گەڕاوەتەوە و نەیاندەزانی و ئەگەر دەیانزانی، جەنگ دژی ساحیبی زەنجیان درێژە پێدەدا. دواتر سوێندیان خوارد لەجەنگ دژی ساحەبی زەنج، شوێنەکانی خۆیان بەجێنەهێڵن تا ئەو کاتەی سەرکەوتن بەدەست دێنن تەنانەت ئەگەر بارودۆخیشیان لێ دژوار بوو، خۆڕاگری دەکەن تا خواوەند لەنێوان ئەوان داوەری دەکات. ئەوان داوایان لەموەفەق کرد ئەو کەشتییانەی ئەوان بۆ جەنگی ساحەبی زەنج دەبات، بگەڕێنێتەوە تا هەرکەس مەبەستی گەڕانەوەی کرد، سەرکەوتوو نەبێت. موەفەق سپاسی کردن و فەرمانی ئامادەباشی دەرکرد.

موەفەق دوای ئەم پێشهاتە تا رۆژی هەینی چاوەڕوان بوو تا نیازەکانی خەڵك دابین بکات. شەوی هەینی فەرمانیدا بەرەبەیانی شەممە بۆ جەنگی ساحەبی زەنج بەرێکەون. لەم کاتەدا خۆی بەناو سوپاکەدا گەڕا و هەر سەرکردەیەك لەشوێنەکەی خۆی وەستا و پێگەی ئەوی ناساند. موەفەق ڕۆژی شەممە، دووەم شەوی سەفەر/ دوانزەی ئۆگۆست، خەڵکانی ڕەوانە و فەرمانیدا کەشتییەکان بگەڕێنەوە. کەشتیەکان گەڕانەوە و موەفەق ئەوانی بۆ شوێنێك ڕێنوێنی کرد کەدەبوا لەوێ چاوی پێیان بکەوێت.

ساحەبی زەنج و هاوەڵانی دوای گەڕانەوەی سوپاکەی موەفەق بۆ شارەکەی

خۆیان گەڕابوونەوە و هیوادار بوون ڕۆژەکان بەسەر بچێت و سوپاکەی موەفەق دەست لەجەنگ هەڵگرێت. موەفەق ئەو کۆیلە سوار و پیادانەی بینی کەخێراییان کردە پیشە و پێش سوپاکە کەوتن و ڕووبەڕووی ساحەبی زەنج و سوپاکەی بوونەوە و شکستیان پێهێنان. هاوەڵانی موەفەق شوێنیان کەوتن و هەرکەسیان دەگرت، دەیانکوشت یا دەیانکردە کۆیلە. ساحەبی زەنج لەگەڵ دەستەیەك لەپاسەوانەکانی خۆی وەك موهەلبی لەسوپاکە جیابوویەوە. ئەنکلای و سلێمان کوڕی جامیع خۆیان لەو دوور خستەوە. هەردەستەیەك ڕووبەڕووی سوپایەکی گەورە ببوویەوە.

باوکی عەباس پێشڕەوی کردبوو. هەڵاتوانی لەشوێنێك بەناوی عەسکەری ڕەیحان گرت و سوپاکەی دەستیان بۆ شمشێر برد. دەستەیەکی دیکە بۆ هاوکاری سوپاکەی ساحەبی زەنج هاتن و سوپای باوکی عەباس ڕووبەڕووی ئەوانیش بوویەوە و ژمارەیەك لەوانیان کوشت و سلێمان کوڕی جامعیان ئەسیر کرد. بێ هیچ پەیمانێك ئەویان بردە لای موەفەق. خەڵك لەگرفتار بوونی ئەو شادمان بوون و بانگی تەکبیر بەرز بوویەوە و سوپاکەی موەفەق لەسەرکەوتنی خۆیان دڵنیا بوون چوونکە زۆرینەی سوپاکەی ساحەبی زەنج چیتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبوون. ئیبراهیم کوڕی جەعفەری هەمەدانیش گرفتار بوو. ئەو یەکێك لەسەرکردەکانی ساحەبی زەنج بوو. موەفەق فەرمانی بەستنەوەی ئەوانی دەرکرد و لەناو کەشتییەکەی باوکی عەباس زیندانی کردن.

ئەو زەنگییانەی لەساحەبی زەنج جیاببوونەوە، هێرشیان کردە سەر سوپاکەی موەفەق و پاشەکشێیان پێکردن بەڵام ئەم هێرشە هێزی ئەوانی لاواز کرد. کاتێك موەفەق هەستی بەلاوازی ئەوان کرد، بەخێرایی مەبەستی کوشتنی ساحەبی زەنجی کرد. هاوەڵانی موەفەق شوێنی کەوتن و موەفەق گەیشتە کۆتایی ڕووباری باوکی خەسیب کەمژدەدەر هەواڵی کوژرانی ساحەبی زەنجی پێدا. مژدەدەرێکی دیکە هات و لەپێی دەستێکی بەدەستەوە بوو و وتی ئەمە لەپێی دەستی ساحەبی زەنجە. لەم کاتەدا بەندەیەك لەسوپاکەی لۆلۆ کەسەری ساحەبی زەنجی بەدەستەوە بوو، ڕایدەکرد. موەفەق ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و نیشانی ئەمان

بەخشراوەکانیدا و ئەوان ناسیانەوە. موەفەق سەری لەزەوی سوو و خەڵکانیش بەدوای ئەو سەری کوڕنوشیان بۆ پەروەردگار دانەواند. موەفەق فەرمانیدا سەری ئەو بەرمەوە بکەن. خەڵکان بەجوانی سەیریان کرد و ناسیانەوە.

کاتێك دەوری ساحەبی زەنجیان گرت، موهەلبی تەنیا بوو و مەبەستی هەڵاتنی کرد و رووی کردە رووباری ئەمیر و بۆ رزگار کردنی خۆی، خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە. ئەنکلای پێشتر لەباوکی جیاببوویەوە و رێگەی دیناری گرتبووە بەر.

موەفەق و سوپاکەی بۆ موەفەقییە گەڕانەوە. لەرێگەی گەڕانەوە، سەری ساحەبی زەنجیان لەپێشیەوە دەبرد و موەفەق بەردەوام سەیری دەکرد. دەستەیەکی فراوان لەزەنگییەکان هاتنە لای موەفەق و داوای ئەمانیان کرد. موەفەق ئەمانی پێ بەخشین. هەواڵی ئەنکلای و موهەلبی و شوێن و جێگەی ئەوان بەموەفەق گەیشت. کەسانێکی بۆ گرتنی ئەوان ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان باوردۆخیان لێ دژوار بکەن. هەڵاتووان کاتێك دڵنیا بوون هیچ پەناگەیەك نییە، ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکان نیشاندا و نێردراوانی موەفەق ئەوانیان قۆڵبەست کرد. ژمارەیان نزیکەی پێنج هەزارکەس بوو. موەفەق فەرمانی قۆڵبەست کردنی ئەنکلای و موهەلبی دەرکرد. یەکێك لەو کەسانەی هەڵاتبوو، قەرتاسی رۆمی بوو کەرمی لەسینەی موەفەقدا بوو. ئەو گەیشتە رامهورموز و پیاوێك ئەوی ناسییەوە و فەرمانڕەوای شارەکەی لێ ئاگادار کردەوە. فەرمانڕەوا ئەوی گرت و ڕەوانەی بارەگای موەفەقی کرد. باوکی عەباس خوێنی ڕشت.

لەم ساڵەدا دەرمویەی زەنگی داوای ئەمانی لەباوکی ئەحمەد موەفەق کرد. ئەو یەکێك لەشاسوارەکان و جەنگاوەرە بوێرەکانی ساحەبی زەنج بوو. ساحەبی زەنج پێش لەناوچوونی خۆی ئەوی بۆ شوێنێك دارستان ناردبوو کەهاوسنوری بەتیحەیە. ئەو و هاوەڵانی بەبەلەمە بچووکەکان رێگەیان لەرێبواران دەگرت. هەرکات شوێنیان دەکەوتن دەڕۆشتنە ناو رووبارە بچووکەکان و لەناو دارستانەکان خۆیان دەشاردەوە و دواتر روویان دەکردە گوندەکانی بەتیحە و رێگرییان دەکرد. رۆژێك رووبەرووی دەستەیەك لەسوپاکەی موەفەق بوونەوە کە لەگەڵ ژنەکانیان بۆ ماڵەکانیان دەگەڕانەوە، پیاوەکانیان کوشت و ژنەکانیان لەگەڵ خۆیان برد. دەرمویە لەژنە گرفتارەکان هەواڵی بارودۆخی پرسی و ژنان پێیان وت: ساحەبی زەنج کوژراوە و سەرکردەکانی دیکە داوای ئەمانیان کردووە وموەفەق ئەمانی پێ بەخشیون. دەرمویە

پەشیمان بوویەوە و تەنیا بیری لەوەرگرتنی ئەمان کردووە. کەسی بۆ لای موەفەق نارد و داوای ئەمانی کرد. موەفەق رازی بوو. دەرمویە و هەموو هاوەڵانی هاتنە ئوردووگاکەی موەفەق و موەفەق ئەمانی پێبەخشین.

کاتێك دەرمویە ئاسوودە بوو، سامان و کاڵاکانی ئاشکرا کرد و بەئاشکرا بۆ خاوەنەکانی گەڕاندەوە. بەم شێوەیە چاکەکاری ئەو دەرکەوت و موەفەق زیاتر لەجاران رێزی گرت و چاکەی لەگەڵدا کرد. فەرمانیدا نامە بۆ شارە ئیسلامییەکان بنووسن کەزەنگییەکان دەتوانن بۆ شارەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. بەم شێوەیە زەنگییەکان روویان کردە سەرزەمینەکانی خۆیان و موەفەق، لەموەفەقییە مایەوە تا خەڵکان لەمانەوەی ئەو ئاسوودە و دڵنیا بن. ئەو یەکێك لەسەرکردە چاکەکارەکانی خۆی وەك فەرمانڕەوای بەسرە، ئوبولە و ئاوەدانییەکانی دیجلە ڕەوانە کرد. ئەویان بەعەباس کوڕی تەرکەس ناو دەبرد. موەفەق فەرمانی مانەوەی لەبەسرە پێدا و محەممەد کوڕی حیمادی وەك قازی بەسرە و ئوبولە و ئاوەدانییەکانی دیجلە دەستنیشان کرد.

باوکی عەباسی کوڕی بۆ بەغداد نارد وسەری ساحەبی زەنجی پێسپارد تا خەڵکان ببینن.

باوکی عەباس لەجومادی الاوەل/ بیست و پێنجی نۆڤەمبەری ئەم ساڵە گەیشتە بەغداد.

شۆڕشی ساحەبی زەنج لەرۆژی چوارشەممە بیست و شەشی مانگی رەمەزانی ٢٥٥/ نۆی سێپتامبەری ٨٦٨ زایینی بوو و لەرۆژی شەممە دووی سەفەری ٢٧٠/ دوانزەی ئۆگۆستی ٨٨٣ زایینی کوژرا. رۆژگاری ئەو چواردەساڵ و چوار مانگ و شەش رۆژ درێژەی کێشا. سەبارەت بەموەفەق و کوژرانی زەنگییەکان چەندین هۆنراوە هۆنرانەوە کەیەکیان هۆنراوەی یەحیا کوڕی محەممەدی ئەسلەمییە:

| | |
|---|---|
| اقول و قد جاء البشير بوقعة | اعزت من الاسلام ما كان واهيا |
| جزى الله خير الناس للناس بعدما | ابيح حماهم خير ما كان جازيا |
| تفرد، اذلم ينصر الله ناصر | بتجديد دين كان اصبح باليا |
| و تجديد ملك قد و هى بعد عزة | و اخذ بثارات تبين الاعاديا |
| ورد عمارات ازيلت و اخربت | ليرجع فىء قد تخرم وافيا |

و ترجع امصار ابيحت و احرقت　　مرارا فقد امست قواء عوافيا

و يشفى صدور المسلمين بوقعة　　يقر بها منها العيون البواكيا

و يتلى كتاب الله فى كل مسجد　　و يلقى دعاء الطالبين خاسيا

فاعرض عن احبابه و نعيمه　　و عن لذة الدنيا و اصبح عاريا

واتاكەی: ئەو کاتەی مژدەدەر هەواڵی ئەو جەنگەی هێنا کەئەو سستی و لاوازییەی لەئیسلامدا دروست بوو، بەهێزی کرد، وتم: خواوەندا، ئەوکەسەی لەهەموان بۆ هەموان باشترە، پاداشت بدات. لەو کاتەی کەس هاوکاری خواوەندی نەدەکرد تەنیا کەسێك بوو بۆ زیندوو کردنەوەی دینی کۆنبوو و تۆڵەسەندنەوەی ئەوەی بووە هۆی لەناوچوونی دوژمنان، هەوڵیدا، تا ئەو ئاوەدانییانەی وێران و خاپور کرابوو، ئاوەدان بکرێتەوە و ئەوشارانەی تاڵان کرابوو و سوتابوو و سامانەکانی بەڕەوا لەقەڵەمدرابوو، سەر لەنوێ نۆژەن بکرێتەوە و دڵی باوەڕداران لەو جەنگەی چاوە پڕ گریانەکانی ئێمەی روون کردەوە، خۆش ببێت و کتێبی خواوەند لەهەر مزگەوتێك بخوێندرێتەوە و بانگەوازی تالبییەکان (مناڵەکانی تالیب، لێرەدا مەبەست ساحەبی زەنجە کەعەلەوی و لەڕەچەڵەکی تالبییەکانە) ریسوا ببێت کە لەجەنگ لەهاوەڵان و پێگە و بەختەوەرییەکانی جیهان دوور کەوتەوە و رووت و تەنیا مایەوە.

قەسیدەیەکی دوور و درێژە و کەسانی دیکە هۆنراوەی دیکەیان هۆنییەوە. بەم شێوەیە بەسەرهاتی زەنگییەکان کۆتایی پێهات.

## زاڵبوونی موسوڵمانان بەسەر رۆمییەکان

لەمساڵەدا رۆمییەکان لەگەڵ سەد هەزار سەرباز هاتنەدەر و لەقەلمییە لەشەش میلی تەرسوس ئوردوویان لێدا. بازمار (بازیار، مازیار) بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەریان و لەرەبیع الاوەل/ سێپتامبەر پەلاماریدان. ەك دەڵێن حەفتا هەزار کەسی لێ کوشتن و فەرماندەی ئەوان بەتریق ئەلباریقە (سەرکردەی سەرکردەکان) کوژرا. بازمار هەروەها بەتریقی فەنادین و بەتریقی ناتلیقی کوشت و بەتریقی قوڕە بریندار هەڵات. لەم جەنگەدا لەرۆمییەکان حەوت خاچی زێڕین و

سیمین و گەورەترین خاچی زێڕین و گەوهەر نیشانی ئەوان و پانزە هەزار چوارپێی زیندار و شمشێرە ئاودراوەکان و چوار تەختی زێڕین و دووسەد تەختی سیمین و دەفرە فراوانەکان و نزیکەی دە هەزار ئالآی حەریر و دیبای فراوان بەجێما.

## مەرگی حەسەن کوڕی زەید و فەرمانڕەوایی محەممەدی برای

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی، فەرمانڕەوای تەبەرستان، لەمانگی رەجەب/ ژانویە، کۆچی دوای کرد. فەرمانڕەوایی ئەو نۆزدە ساڵ و هەشت مانگ و شەش رۆژ درێژەی کێشا. دوای ئەو محەممەدی برای لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت.

حەسەن بەخشندە بوو. رۆژێك پیاوێك وەسفی کرد و حەسەن دە هەزار درهەمی پێدا. ئەو کەسێکی لەخۆبوردوو لەبەرابەر پەروەدگار بوو.

دەگێڕنەوە رۆژێك شاعیرێك وەسفی کرد و وتی: خواوەند یەکێکە و کوڕی زەید یەکێك. حەسەن وتی: قوڕ بەدەمت، بۆ نەتوت خواوەند یەکێکە و کوڕی زەید بەندەی ئەو. دواتر لەتەختەکەی هاتەخوار و سەری کڕنوشی دانەواند و هیچی بەشاعیرەکە نەدا. ئەو فیقە و زمانی عەرەبی بەباشی دەزانی. شاعیرێك بەم شێوەیە وەسفی کردووە:

لا تقل بشرى و لكن بشربان          عزة الداعى و يوم المهرجان

واتاکەی: ئەگەر مژدە دەدەیت، دوو مژدە بدە، رێزداری بانگەوازکەر و رۆژی مێهرەگان.

کوڕی زەید لەوەڵامدا پێی وت: دەبوا هەر دێڕێکی هۆنراوەکەی خۆت بەوشەیەك جگە لە(لا) دەست پێدەکرد چوونکە شاعیری بەتوانا بۆ سەرەتای هۆنراوەکەی وشەیەك هەڵدەبژێرێت بەگوێی بیسەر خۆش و پەسەند بێت، ئەگەر ئەم وشەت لەبەشی دووەم دەهێنا، رازاوەتر بوو. شاعیر پێی وت: لەجیهان هیچ وتەیەك بەنرختر لەم وتەیە نییە: ((لا اله الا الله) و بەلا دەستی پێکردووە. کوڕی

زەید وتی: ڕاست دەکەیت و پاداشی پێ بەخشی.

دەگێڕنەوە گۆرانیبێژێك لای ئەو چەند دێڕێکی لەهۆنراوەی فەزڵ کوڕی عەباس بۆ وەسف کردنی عوتەبە کوڕی ئەبی لەهەب خوێند کەسەرەتاکەی بەم شێوەیە:

و انا الاخضر من يعرفنى        اخضر الجلدة من بيت العرب

واتاکەی: منم ئەو سەوز پێستە، ئەوکەسەی من دەناسێت (دەزانێت) سەوز پێستم لەڕەچەڵەکی عەرەبەکان.

کاتێك گەیشتە ئەم دێرە:

برسول الله و ابنى عمه        و بعباس بن عبدالمطلب

واتاکەی: بەپێغەمبەری خوا و دوو کوڕە مامەکەی و بەعەباس کوڕی عەبدولموتەلیب. گۆڕانی تیا دروست کرد و وتی: (لا بعباس بن عبدالمطلب). حەسەن لێی تووڕە بوو و وتی: ئەی حەرامزا، لەبەر چاوی ئێمە سەرکۆنەی کوڕە مامەکانمان دەکەیت و گۆڕانکاری لەوەسفی ئەوان دێنیتە ئاراوە؟ ئەگەر جارێکی دیکە ئەم کارە دووبارە بکەیتەوە، دەبێتە دواهەمین گۆڕانی تۆ.

## مەرگی ئەحمەد کوڕی تولون و فەرمانڕەوایی خەمارەویەی کوڕی

چۆنیەتی مەرگی ئەو بەم شێوەیە: جێگر و کارگوزاری ئەو لەتەرسوس بەدەستی خزمەتکارەکەی خۆی بازمار (مازیار، بازیار) گرفتار بوو. بازمار دژی ئەحمەد کوڕی تولون شۆڕشی کرد و ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر. ئەحمەد کوڕی تولون سوپای ڕازاندەوە و بۆ جەنگی ئەو بەڕێکەوت. کاتێك گەیشتە ئەزەنە، نامەیەکی بۆ بازمار نووسی بەڵام بازمار گرنگی بەنامەکە نەدا. ئەحمەد کوڕی تولون هێرشی کردەسەر و و گەمارۆیدا. بازمار ئاوی شارەکەی بەرووی ئوردووگاکەی ئەحمەد کردەوە و زۆری نەمابوو سەربازەکانی لەناو بچن. ئەحمەد تولون لەتووڕەییدا پاشەکشێی کرد. ئەم کاتە زستان بوو. پەیکی بۆ لای مازیار نارد و وتی: من پاشەکشێیم نەکرد مەگەر لەترسی ئەوەی ڕێز و شکۆی ئەم سنورە لەناو بچێت و دوژمن چاوی تەماحی تێببڕێت.

کاتێك ئەحمەد کوڕی تولون بۆ ئەنتاکییە گەڕایەوە، بڕێکی زۆر شیری گامێشی خواردەوە و گرفتاری ژانە سك و سك پێچە بوو. نەخۆشی بەجەرگی گەیشت. پزیشکەکان دەرمانیان دەکرد بەڵام ئەو دووبارە بەنهێنی شیری گامێشی دەخوارد. چیتر دەرمانەکان کاریگەرییان نەما و بەم شێوەیە مرد.

فەرمانڕەوایی ئەو نزیکەی بیست و شەش ساڵ درێژەی کێشا. ئەو پیاوێکی بیرمەند، دوورئەندێش، چاکەکار، بەخشندە و باوەڕدار بوو. زاناکان و باوەڕدارانی خۆش دەویست و بۆ چاکەکاری لەگەڵ موسوڵمانان هەوڵی دەدا. ئەو دژی یافای دروست کرد چوونکە ئەم شارە قەڵای نەبوو. ئەو شوێنکەوتەی ئایینی شافیعی و شوێنکەوتەکانی ئەم ئایینەی بەگەورە دەزانی.

دوای ئەو کوڕەکەی خەمارەویە جێگەی باوکی گرتەوە و سەرکردەکان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون بەڵام جێگری باوکی لەدیمەشق ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. خەمارەویە سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و ئەویان لەوێ دوورخستەوە. سوپاکە لەدیمەشقەوە ڕێگەی شیزەری گرتەبەر.

## هێرشی ئیسحاق کوڕی کونداجیق بۆ شام

کاتێك ئەحمەد کوڕی تولون مرد، ئیسحاق کوڕی کونداجیق، فەرمانڕەوایەتی موسڵ و جەزیرەی دەکرد. ئەو و کوڕی باوکی ساج چاوی تەماحیان بڕییە شام و مناڵەکانی ئەحمەد کوڕی تولونیان بەریسوا لەقەڵەمدا. ئەوان لەمبارەوە نامەیان بۆ موەفەق نووسی و داوای هاوکارییان لێکرد. موەفەق فەرمانی گرتنی شامی پێدان و مژدەی هاوکاری کردنی پێدان. ئیسحاق و کوڕی باوکی ساج پەیوەستی یەکبوون و مەبەستی سەرزەمینەکانی دراوسێیان کرد و دەستیان بەسەردا گرت. نوێنەری ئەحمەد کوڕی تولون لەدیمەشق، هاوکاری ئەو دوانەی کرد و بەڵێنی پێدان پەیوەستی ئەوان ببێت. نوێنەرەکانی ئەحمەد لەئەنتاکییە، حەلەب، حیمس گەڕانەوە و فەرمانڕەوای دیمەشق دژی خەمارەویە شۆڕشی کرد و ئیسحاق دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت. هەواڵی ئەم جەنگ و بگرە وبێنە بەسوپاسالارەکەی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد گەیشت. ئەو سوپای بۆ دیمەشق ڕەوانە کرد و دەستیان

بەسەر دیمەشقدا گرت. نوێنەری شارەکە هەڵات. سوپای خەمارەویە ڕێگەی شیزەری گرتەبەر بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئیسحاق کوڕی کونداجیق و باوکی ساج. ئیسحاق کەمتەرخەمی دەکرد چوونکە چاوەڕوانی هێزە پشتیوانەکانی عێراق بوو. زستان هێرشی کردە سەر هەر دوو سوپا و زیانی زۆری لەسوپاکەی کوڕی تولوندا. ئەوان لەناو ماڵەکانی شیزەر بڵاو بوونەوە.

لەم کاتەدا سوپای عێراق بەفەرماندەیی باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی موەفەق یا هەمان موعتەزید باللە بۆ هاوکاری کردنی کونداجیق گەیشتن. کاتێك باوکی عەباس گەیشتە ئەو ناوچە، بەخێرایی هێرشی کردە سەر سوپاکەی خەمارەویە لەشیزەر. سوپاکەی خەمارەویە هێشتا نەکەوتبوونە خۆ کە لەناو ماڵەکاندا سەرکوت و کوشتار کران. ژمارەیەکی زۆریان لیٚ کوژرا و ئەوەی ڕزگاری بوو، بەریسوایی بەرەو دیمەشق هەڵات. موعتەزید شوێنیان کەوت و هەڵاتووان لەدیمەشقەوە ڕێگەی ڕەملەیان گرتەبەر. موعتەزید دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت و لەشەعبانی ساڵیٚ ٢٧١/ ژانویەی ٨٨٥ زایینی ڕۆشتە ناو شام. سوپای کوڕی تولون لەرەملە مایەوە. هەڵاتوان پەیکیان بۆ لای خەمارەویە نارد و ئەویان لەبارودۆخی خۆیان ئاگادار کردەوە. ئەو بەسوپاکەی خۆی لەمیسرەوە مەبەستی شامی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەجومادی الاوەل/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە هارون کوڕی موەفەق لەبەغداد مرد.

لەم ساڵەدا ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان لەسەر دەستی بازمار لەسندیە ئەنجامدرا.

لەشەعبان/ فەوریەی ئەم ساڵە هاوەڵانی باوکی عەباس کوڕی موەفەق دژی ساعید کوڕی مەخلەد وەزیری موەفەق شۆڕشیان کرد و داوای ڕۆژانەیان کرد. هاوەڵانی ساعید ڕووبەڕوویان بوونەوە و شەڕێکی قورس هاتە ئاراوە. ژمارەیەك کوژران و ژمارەیەك لەسوپای باوکی عەباس زیندانی کران. لەم کاتەدا باوکی عەباسی لیٚ نەبوو و بەمەبەستی ڕاو ڕۆشتبووە دەرەوەی شار. ئەم جەنگە تا ئاوا بوونی هەتاو درێژەی کێشا. دواتر دەستیان لەجەنگ هەڵگرت. بەیانی ئەو ڕۆژە، ڕۆژانەیان وەرگرت و هەردوو لا ئاشت بوونەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان ئیسحاق کوڕی کونداجیق و کوڕی دەعباش جەنگ روویدا. کوڕی دەعباش کارگوزاری کوڕی تولون لەڕەققە و پارێزەری سنوری سنورەکانی ئەو دیارە بوو.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی موسا دروست کردنی شاری لاردە (لریدا)ی ئاندۆلۆسی دەست پێکرد. ئەو پێشتر لەگەڵ محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، ناسازگار بوو بەلاّم ساڵێك پێش رێگەی ئاشتی گرتەبەر. کاتێك ئەمیری بەرشەلۆنە (بارسەلۆن) هەواڵی ئاوەدان کردنەوەی شارەکەی بیست، هێزی خۆی کۆکردەوە و بۆ رێگرتن لەم کارە بەرێکەوت. ئیسماعیل کوڕی موسا لەخۆ ئامادە کردنی ئەو ئاگادار بوویەوە و بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. جەنگ روویدا و سوپای فەرەنگ شکستی خوارد و زۆرینەی ئەوان کوژران. جەنازەی بێ گیانی ئەوان بۆ ماوەیەکی زۆر لەو سەرزەمینەدا کەوتبوو.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی جەعفەری ساغانی حافزی قورئان و محەممەد کوڕی موسلیم کوڕی عوسمان، ناسراو بەکوڕی وارەی وازی، کەپێشەوای زانستی حەدیس و چەندین بەرهەمی لەو بارەوە نوسیوە، مردن.

لەم ساڵەدا داود کوڕی عەلی ئیسفەهانی پێشەوای زاهرییەکان، مرد. لەساڵی ٨١٧/٢٠٢ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا موسعەب کوڕی ئەحمەد کوڕی موسعەب باوکی ئەحمەدی سۆفی، هاودەمی جونەید، مرد.

لەم ساڵەدا شەهریاری رۆم کەسیسیلی بوو، جلی مەرگی پۆشی.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیسا کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی خالیدی سەدوسی زوهەلی فەرمانڕەوای خوراسان لەبەغداد مرد. ئەو مەبەستی حەجی لەسەردا بوو کەخەلیفە موعتەمید ئەوی گرت و زیندانی کرد. ئەو لەزیندان مرد. ئەو کەسەیە بوخاری نوسەری صحیحی لەبوخارا دوورخستەوە و بەسەرهاتەکەی بەناوبانگە. بوخاری نفرینی کرد و نفرینی ئەو گیانی گرت.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و یەکی کۆچی ( ٨٨٥ زایینی )

## ناسازگاری محەممەدی عەلەوی و عەلی عەلەوی

لەم ساڵەدا محەممەد و عەلی دوو کوڕەکەی حسەین کوڕی جەعفەر کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتنە مەدینە و خوێنی ژمارەیەك لەشارۆمەندانی ئەو شارەیان ڕشت و سامانەکانیان تالآن کرد. خەڵکانی مەدینە چوار هەینی لەمزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) نۆ نوێژیان لەهەینی خوێند بەلآم نەك بەجەماعەت. فەزڵ کوڕی عەباسی عەلەوی لەم بارەوە دەڵێت:

اخربت دار هجرة المصطفى البـــ ر فابكى خرابها المسلمينا

عين فابكى مقام جبرئيل و القبــ ر فبكى و المنبر الميمونا

و على المسجد الذى اسه التقــ وى خلاء امسى من العابدينا

و على الطيبة التى بارك اللـــ ـــة عليها بخاتم المرسلينا

واتاکەی: شوێن کۆچی مستەفای چاکەکار وێران بوو و وێران بوونی بووە هۆی گریانی موسوڵمانان. ئەی چاو لەشوێنەکەی جبرەئیل فرمێسك لەچاو ببارێنە و لەسەر مینبەری پیرۆز و لەو مزگەوتی لەسەر بنەمای چاکەکاری بناغەی بۆ دارێژرابوو و هەنووکە لەخواپەرەستان خاڵییە، بگری. و بۆ مەدینە کەخواوەند بەهۆی خاتەمی پێغەمبەران ڕێزی لێگرتبوو، بگری.

## لابردنی عەمرۆ کوڕی لەیس لەخوراسان

لەم ساڵەدا موعتەمید حاجییەکانی خوراسانی بانگ کرد و ئەوانی لەلابردنی عەمرۆ کوڕی لەیسی و ئەوەی بەوەی سپاردبوو، ئاگادار کردەوە. لەبەرچاوی ئەوان نفرینی کرد و ئاگاداری کردنەوە کە محەممەد کوڕی تاهیری وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاریکردووە. فەرمانیدا هەموان عەمرۆ لەسەر مینبەرەکان نفرین بکەن.

هەموان نفرینیان کرد. ساعید کوڕی مەخلەد بۆ جەنگی عەمرۆ ڕێگەی فارسی گرتەبەر. محەممەد کوڕی تاهیر، رافیع کوڕی هەرسیمەی بەنوێنەرایەتی خۆی وەك فەرمانڕەوای خوراسان ڕەوانە کرد.

## جەنگی تەواحین

لەم ساڵەدا جەنگی تەواحین لەنێوان باوکی عەباس موعتەزید و خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون ڕوویدا.

هۆکارەکەی ئەوە بوو موعتەزید دوای زاڵبوونی لەدیمەشق، ڕووی کردە ڕەملە ئوردووگای خەمارەویە. لەم کاتەدا ئاگادار بوویەوە خەمارەویە گەشتۆتە ئوردووگاکەی و سوپایەکی گەورە هاوڕێیەتی دەکات. موعتەزید مەبەستی گەڕانەوەی کرد بەڵام هاوەڵانی خەمارەویە کەپەیوەستی ببوون، ڕێگەی ئەم کارەیان لێگرت. لەلایەکی دیکە موعتەزید، کوڕی کونداجیق و کوڕی باوکی ساجی بەترسەنۆك لەقەڵەمدا بوو لەبەر ئەوەی پێش گەیشتنی ئەو جەنگیان دەست پێنەکردبوو. ئەم دوو سەرکردەیە ڕقی موعتەزیدیان لەدڵ گرت.

کاتێك خەمارەویە گەیشتە ڕەملە، لەکەنار ئاوێك ئوردووی لێدا. چەندین ئاش لەو ناوچەیە دەبینران. خەمارەویە دەستی بەسەر ئاشەکاندا گرت و لەبەر ئەمە، ئەم جەنگە بەجەنگی تەواحین (ئاشەکان) ناوی دەرکرد. موعتەزید کەهاوەڵانی کۆکردبوویەوە، گەیشتە ئەو ناوچە. خەمارەویە سوپاکەی ڕازاندەوە و بەفەرماندەیی سەعیدی ئەیسەر بۆسەیەکی بۆ سوپاکەی موعتەزید نایەوە. باڵی چەپی موعتەزید هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی خەمارەویە و باڵی ڕاستی خەمارەویە شکستی خوارد. خەمارەویە لەبەر بێ ئەزمونی لەجەنگ لەگەڵ ناشارەزاکان لەجەنگ بێ ئەوەی ئاوڕ بداتە، هەڵات و ڕێگەی میسری گرتەبەر.

موعتەزید گەیشتە خێوەتەکانی خەمارەویە. ئەو لەسەرکەوتنی خۆی دڵنیا ببوو کە لەناکاو سوپاکەی ژێر فەرمانی سەعیدی ئەیسەر لەناکاو هاتنەدەر و پاشماوەکانی سوپاکەی خەمارەویە پەیوەستیان بوون و هێرشیان کردە سەر

سوپاکەی موعتەزید کەسەرقاڵی تالانی بوون. میسرییەکان دەستیان بۆ شمشێر برد و موعتەزید گومانی کرد خەمارەویە گەڕاوەتەوە. سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و بێ ئەوەی گرنگی بەهیچ بدات، هەلات و رێگەی دیمەشقی گرتەبەر بەلام دانیشتوانی شارەکە دەرگایان بۆ نەکردەوە. ئەو هەلات وبەرەو تەرسوس رۆشتن. ئەمە لەکاتێکدا بوو دوو سوپا لەجەنگ بەردەوام بوون بێ ئەوەی فەرماندەیان هەبێت.

سەعیدی ئەیسەر بەدوای خەمارەویەدا گەرا بەلام نەیدۆزییەوە لەبەر ئەمە براکەی باوکی عەشائری وەك فەرماندەی دیاری کرد. عێراقییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ئەسیر کران.

سەعید بەسوپاییەکانی وت: ئەمە برای فەرماندەکەی ئێوەیە و ئەمە سامانە و لەناو ئێوەدا دابەشی دەکات. سوپا سەرقاڵی سامانەکان بوون و بیریان لەئاژاوە نەکردەوە (بۆهەلاتنی خەمارەویە). مژدەی سەرکەوتنی ئەوان گەیشتە میسر و خەمارەویە لەم سەرکەوتنە شادمان و لەهەلاتنی خۆی شەرمەزار بوو. ئەو چاکەی زیاتری لەگەڵ کردن و بەشێوەیەك لەگەڵ ئەسیرەکان هەڵس و کەوتی کرد پێشتر ئەو کردەویە لەکەس نەبینرابوو. بەهاوەلانی وت: ئەم دەستەیە میوانی ئێوەن، کەواتە چاکەیان لەگەڵ بکەن. دواتر ئەسیرەکانی کۆکردەوە و وتی: هەرکەس خوازیاری گەڕانەوەیە، خەرجی رێگەی پێ دەدەین و رەوانەی دەکەین. دەستەیەك مانەوەو دەستەیەك رێزدارانە بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. سوپاییەکانی خەمارەویە بۆ شام گەڕانەوە و دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت. فەرمانڕەوایی خەمارەویە لەو ناوچەیە سەقامگیر کرا.

## جەنگی سوپای خەلیفە لەگەڵ سوپای عەمرۆ سەفار

لەدەی رەبیع الاوەل/ حەوتی سێپتامبەری ئەم ساڵە لەنێوان سوپای خەلیفە و سوپای عەمر کوڕی لەیسی سەفاری جەنگ روویدا. ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف لەناو سوپاکەی خەلیفەدا دەبینرا. ئەم جەنگە لەبەرەبەیان تا نیمەڕۆ

درێژەی کێشا و لەکۆتایی عەمرۆ و سوپاکەی کەپانزە هەزار سوار و پیادە بوون، شکستیان خوارد. درهەمی فەرماندەی سوپاکەی عەمرۆ کوڕی لەیس بریندار بوو و سەد کەس لەپاسەوانەکانیان کوژران و سێ هەزار کەسیان ئەسیر کران. هەزار کەس داوای ئەمانیان کرد و لەئوردووگاکەی عەمرۆ سی هەزار چوارپێ و مانگا و کەر و کاڵای دیکە وەك تاڵانی بەدەست هات.

## جەنگەکانی ئاندۆلۆس و ئەفریقییە

لەم ساڵەدا محەممەد، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، سوپایەکی بەفەرماندەیی مونزەری کوڕی بۆ شاری بەتلیوس ڕەوانە کرد. کوڕی مەروانی جەلیقی کەمەبەستی ناسازگاری لەسەردا بوو، لەوێ ڕۆشت – پێشتر ئاماژەمان پێدا– و رووی کردە قەڵای ئەشیرە غەرە و سەنگەری گرت. مونزەر شاری بەتلیوسی سوتاند. محەممەد سوپایەکی بەفەرماندەیی هاشم کوڕی عەبدولعەزیز بۆ شاری ساراگوزا ڕەوانە کرد. ئەمیری ئەم شارە محەممەد کوڕی لەب کوڕی موسا بوو. هاشم دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و محەممەدی دەرپەڕاند. عومەر کوڕی حەفسون هاورێیەتی ئەوی دەکرد. ئەویش دژی فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس ئاڵای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە بەڵام سەرئەنجام ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر.

کاتێك ئەوان بۆ کوردوبا گەڕانەوە.، عومەر کوڕی حەفسون هەڵات و بەمەبەستی ناسازگاری رووی کردە بەربوشتەر. فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس مەبەستی گرتنی ئەوی کرد. لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵەکانی داهاتوو ئاماژەی پێدەدەین.

لەم ساڵەدا دەستەیەکی گەورە لەموسوڵمانەکانی سیسیل روویان کردە رەمتە و وێرانیان کرد و ئەوەی دەستیان کەوت، تاڵانیان کرد و هەرکەسیان بینی، گرفتاریان کرد و گەڕانەوە.

فەرمانڕەوای سیسیل، حسەین کوڕی ئەحمەد، مرد و دوای ئەو سوادە کوڕی محەممەد کوڕی خەفاجەی تەمیمی لەسەر تەخت دانیشت و ڕێگەی سیسیلی گرتەبەر. لەگەڵ سوپایەکی گەورە رووی کردە قەتانییە و ئەوەی گرتی، کوشتی.

لەوێوە رووی کردە تەبەرمین و لەگەڵ شارۆمەندانی ئەو شارە جەنگا و زەوییە کشتوکاڵییەکانی پێشێل کرد. بەرادەیەك پێشرەوی کرد کەنێردراوی بەتریقی رۆم هاتە لای و پێشنیاری ئاشتی و ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکانی پێدا. سوادە بۆ ماوەی سێ مانگ ئاگربڕی راگەیاند. بەتریق سێسەد موسوڵمانی ئەسیری ئازاد کرد و بەم شێوەیە سوادە بۆ بەلەرم گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی محەممەدی تائی فەرمانڕەوایەتی مەدینە و رێگەی مەککەی گرتەدەست. لەم کاتەدا یوسف کوڕی باوکی ساج، فەرمانڕەوای مەککە، هێرشی کردە سەر بەدر، بەندەی تائی کەسەرکردەی حاجییەکان بوو. لەگەڵ ئەو جەنگا و ئەسیری کرد. سوپا و حاجییەکان دژی یوسف کوڕی باوکی ساج شۆڕشیان کرد و جەنگیان دەستپێکرد. بەدریان رزگار و یوسف کوڕی باوکی ساجیان گرت و رەوانەی بەغدادیان کرد. جەنگ لەنێوان ئەوان لەبەردەم مزگەوتی حەرام روویدا.

لەم ساڵەدا هەموان، ماڵی کۆنی پشتی رووباری عیسایان وێران و سامانەکەیان تالان و دەرگاکانیان هەڵکەند. حەسەن کوڕی ئیسماعیل، فەرماندەی ئاسایشی بەغداد بەنوێنەرایەتی محەممەد کوڕی تاهیر، هێرشی کردە سەریان و رێگەی نەدا بەتەواوی وێرانی بکەن. چەند رۆژێك لەگەڵ خەڵکانی کۆڵان و گەڕەکەکان هاموشۆی کرد و روودانی جەنگ نزیك کەوتەوە. سەرئەنجام دوای چەند رۆژ وێرانییەکان سەر لەنوێ نۆژەن کرایەوە. نۆژەن کردنەوەی ئەم ماڵە، بەهاوکاری عەبدون برای ساعید کوڕی مەخلەد روویدا.

هارون کوڕی ئیسحاق رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی مەنسوری بەسری مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و دووی کۆچی ( ٨٨٦ زایینی )

## جەنگ لەنێوان ئەزکوتکین و محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی

لەنیوەی جومادی الاوەل/ بیست و نۆی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە جەنگێکی قورس لەنێوان ئەزکوتکین و محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی، فەرمانڕەوای تەبەرستان ڕوویدا. ئەزکوتکین لەقەزوێنەوە ڕێگەی ڕەی گرتەبەر و چوار هەزار سوار هاوڕێیەتیان دەکرد. سوپایەکی گەورە لەدەیلەمییەکان و تەبەرستانییەکان و خوراسانییەکان هاوڕێیەتی محەممەدیان دەکرد. جەنگ ڕوویدا و سوپای محەممەد کوڕی زەید شکستی خوارد. ئەزکوتکین و سوپاکەی دارایی و چوارپێکانی ئەوانیان تالآن کرد کەپێشتر هاوشێوەی ئەو تالآنییە زۆرەیان نەبینیبوو. ئەزکوتکین هاتەڕەی و لەوێ مایەوە. لەدانیشتوانەکەی سەد هەزار دینار باجی وەرگرت و کارگوزارەکانی خۆی بۆ دەوروبەری ڕەی نارد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەنێوان باوکی عەباس کوڕی موەفەق و بازمار لەتەرسوس جەنگ ڕوویدا. دانیشتوانی تەرسوس دژی باوکی عەباس شۆڕشیان کرد و ئەویان لەشارەکە دەرپەڕاند. ئەو لەنیوەی موحەرەم/ سێی جولای ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی وەهب کە لەناو سوپاکەی موەفەقدا بوو لەمانگی سەفەر/ جولای، مرد.

لەم ساڵەدا پیاوێکی خارجی لەڕێگەی خوراسان یاخیگەری کردە پیشە و دواتر ڕوویکردە دەستکەرت ئەلموك و لەوێ کوژرا. لەم ساڵەدا حەمدان کوڕی حەمدون و هارونی شاری ڕۆشتنە ناو شاری موسڵ. شاری لەمزگەوتی هەینی ئەو شارە نوێژی خوێند.

لەم ساڵەدا لەناو زیندانی مەتبەق تونێلیان لێدا و دووبانی عەلەوی و گەنجەکانی هاورێی ئەو هاتنەدەر و سوار ئەسپە ئامادە کراوەکان بوون و خۆیان رزگار کرد. دەروازەکانی بەغدادیان بەست و دووبانی و هاوەڵانی ئەویان گرت. موەفەق لەواستەوە فەرمانیدا دەست و پێی ئەو بەپێچەوانەوە ببڕنەوە (پێی راست و دەستی چەپ یا پێی چەپ و دەستی راست) سەربازەکان ئەو کارەیان کرد.

لەم ساڵەدا ساعید کوڕی مەخلەد لەفارسەوە رووی کردە واست. موەفەق فەرمانی بەهەموو سەرکردەکاندا پێشوازی لێبکەن. ئەوان ڕۆشتن و بۆ رێزگرتن لەو لەئەسپ هاتنەخوار و دەستیان ماچ کرد. ئەو لەسەر بنەمای لەخۆبایی بوون قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد بەڵام دواتر موەفەق دەستی بەسەر ماڵ و سامانی خۆی و بنەماڵەکەی گرت و تاڵانی کرد. گرتنی ئەو لەمانگی رەجەب/ دێسامبەر روویدا. دوو براکەی ئەو باوکی عیسا و ساحیل و براکەی عەبدون لەبەغداد دەستگیر کران. لەجێگەی عەبدون، باوکی سەقەر ئیسماعیل کوڕی بولبول وەك دەبیر دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا مناڵەکانی شەیبان و هاوەڵانی ئەوان لەزانین، دەوروبەری موسڵ، ئوردوویان لێدا و لەو ناوچەیە خراپەکارییان کردە پیشە. هارون خارجی بۆ دەرپەڕاندنی ئەوان هێرشی کرد و نامەیەکی بۆ حەمدان کوڕی حەمدونی تەغلەبی نووسی کەبەرەو ئەو لەرێگەدایە. هارون رێگەی موسڵی گرتەبەر و حەمدان و سوپاکەی بۆ لای ئەو بەرێکەوتن. دواتر لەبەشی رۆژهەڵاتی دیجلە گوزەریان کرد و هەموویان رێگەی رووباری خازریان گرتەبەر و لەخێوەتەکانی مناڵەکانی شەیبان نزیك بوونەوە. پێشەنگەکانی مناڵەکانی شەیبان، رووبەرووی پێشەنگەکانی سوپای هارون بوونەوە و سەربازەکانی هارون شکستیان خوارد و هارون هەڵات. خەڵکانی نەینەوا شارەکەیان چۆڵ کرد مەگەر ئەوکەسانەی لەناو کۆشکەکاندا جێگیر ببوون.

هەروەها لەجومادی الاخرە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ئەرد هەژێنێکی مەترسیدار میسری لەراندەوە و ماڵ و مزگەوتی هەینی خاپور کرد. تەنیا لەماوەی یەك رۆژ هەزار جەنازە لەژێر داروپەردوو هێنرایە دەر.

لەم ساڵەدا گرانی لەبەغداد دەرکەوت. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو خەڵکانی سامەرا رێگەیان نەدەدا کەشتییەکانی هەڵگری خواردەمەنی بگاتە ئەو شارە و تائیش رێگر بوو لەگەیشتنی خەرمان کوت بۆ زەویدارەکان بۆ ئەوەی نرخەکان بەرز ببێتەوە. خەڵکانی بەغدادیش رێگەیان نەدا رۆن و سابون و شتەکانی دیکە بۆ سامەرا ببرێت. بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر تائی. تائیش سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و رووبەروویان بوویەوە. ژمارەیەك لەهەردوولا برینداربوون. محەممەد کوڕی تاهیر سەرۆکی ئاسایشی شارەکە، رێگەی لەپەرەسەندنی جەنگ گرت وهێوری کردنەوە.

لەشەوال/ مارسی ئەم ساڵە ئیسماعیل کوڕی بەریەی هاشمی و عوبەیداللە کوڕی عەبدوللەی هاشمی مردن.

لەم ساڵەدا زەنگییەکان لەواست کەوتنە جموجۆڵ و بانگیان بەرز کردەوە: ئەنکلای، ئەی مەنسور، ئەو و موهەلبی و سلێمان کوڕی جامیع و دەستەیەك لەسەرکردەکانیان لەناو زیندانەکانی موەفەقدا بوون. موەفەق دوای ئەم رووداوانە فەرمانی کوشتنی ئەوانی نووسی و ئەوانیان کوشت. سەری ئەوان ڕەوانەی بارەگای موەفەق کرا و جەستەیان لەبەغداد بەدارەوە کرا.

لەم ساڵەدا بارودۆخی مەدینەی پێغەمبەر(د.خ) هێور بوویەوە و خەڵکان گەڕانەوە بۆ شارەکە.

لەم ساڵەدا بازمار جەنگی هاوینەی ئەنجامدا. هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس سوپایەکی بۆ هێرش کردنە سەر کوڕی مەروانی جەلیقی لەقەڵای ئەشیر غەرە ڕەوانە کرد. سەربازەکان دەوریان گرت و بارودۆخیان لێ دژوار کرد. ئەو سوپایەکی دیکەی بۆجەنگی عومەر کوڕی حەفسون لەقەڵای بەربوشتەر ڕەوانە کرد. هەروەها لەم ساڵەدا ئاگر بڕ لەنێوان سوادە ئەمیری سەقەلییە و رۆمییەکان شکا. سوادە سوپایەکی بۆ سەرزەمینی رۆم ڕەوانە کرد و تالانی دەست کەوت و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا بەتریقێك ناسراو بەئەنجفوز لەگەڵ سوپایەکی گەورە

لەقوستەنتەنییە بەرێکەوت و لەشاری رسبەرینە دابەزی و گەمارۆی خستەسەر و بارودۆخی لەموسوڵمانانی ئەو دیارە دژوار کرد. موسوڵمانان بەمەرجی وەرگرتنی ئەمان شارەکەیان تەسلیم کرد و خۆیان پەنایان بۆ سەقەلییە برد. دواتر ئەنجفور سوپایەکی بۆ شاری مەنتییە ڕەوانە کرد. گەمارۆی ئەم شارەیاندا و خەڵکەکەی بەمەرجی پەنابردن بۆ بەلەرم لەسەقەلییە شارەکەیان تەسلیم کرد.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی ساڵح عەبدولرەحمانی ئەنماتی، ناسراو بەکەنجەلە لەهاوەڵانی یەحیا کوڕی موعین کۆچی دوایی کرد. لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عەبدوئەلجەبار کوڕی محەممەد کوڕی عوتاردی تەمیمی مرد. لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی وەلیدی خەشخاش مرد. لەم ساڵەدا شوعەیب کوڕی بوکاری کاتیب کە لەباوکی عاسمی نەبیل حەدیسی دەگێڕایەوە، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و سێی کۆچی ( ٨٨٦ زایینی )

## ناسازگاری کوڕی باوکی ساج و کوڕی کونداجیق و خوێندنەوەی وتار بەناوی کوڕی تولون لەجەزیرە

لەم ساڵەدا لەنێوان محەممەد کوڕی باوکی ساج و ئیسحاق کوڕی کونداجیق ئاژاوە کەوتەوە. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کوڕی باوکی ساج لەکاروبارەکان لاسایی ئیسحاقی دەکردەوە و مەبەستی ئەوەی کرد پێشی کەوێت بەڵام ئیسحاق ڕێگەی پێنەدەدا. کوڕی باوکی ساج کەسی بۆ لای خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون، فەرمانڕەوای میسر نارد و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی نیشاندا و لەسنووری خۆی لەقینسرین بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە و دیودادی کوڕی هاوشێوەی بارمتە بۆ لای خەمارەویە نارد. خەمارەویە سامانێکی زۆری بۆ خۆی و سەرکردەکانی ڕەوانە کرد.

خەمارەویە بەرەو شام کەوتە ڕێ و لەگەڵ کوڕی باوکی ساج لەبالیس چاویان بەیەك کەوت. دواتر کوڕی باوکی ساج لەڕووباری فورات گوزەری کرد و ڕووی کردە ڕەققە. کوڕی کونداجیق ڕووبەڕووی بوویەوە و لەنێوان دوو سوپا ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. سەرئەنجام سوپای کوڕی کونداجیق شکستی خوارد و کوڕی باوکی ساج دەستی بەسەر سنووری فەرمانڕەوایەتی کوڕی کونداجیقدا گرت. خەمارەویە لەفورات گوزەری کرد و گەیشتە رافیقە. ئیسحاق خۆی گەیاندە قەڵای ماردین. کوڕی باوکی ساج دەوری گرت و ئیسحاق بۆ سینجار هەڵات و لەو ناوچە ڕووبەڕووی دەستەیەك لەعەرەبە دەشتەکییەکان بوویەوە. کوڕی کونداجیق لەماردینەوە ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و کوڕی ساج لەبەرقەعید ئەوی بینی و بۆسەی بۆ نایەوە. لەکاتی جەنگ، ئەوانەی خۆیان حەشاردابوو، لەبەرابەر کوڕی کونداجیق خۆیان ئاشکرا کرد و ئەو هەڵات وبۆ ماردین گەڕایەوە. لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی پێگەی کوڕی باوکی ساج بەرز بوویەوە و دەستی بەسەر جەزیرە و موسڵدا گرت. لەسەرەتا بۆ خەمارەویە و دواتر وتاری بەناوی خۆی دەخوێندەوە.

## جەنگی نێوان سوپای کوڕی باوکی ساج و شارییەکان

کاتێك کوڕی باوکی ساج دەستی بەسەر موسڵدا گرت، دەستەیەك لەسوپاییەکانی خۆی لەگەڵ کۆیلەکەی بەناوی فەتح (یەکێك لەبوێرەکان و کەسە نزیکەکانی بوو) بۆ مەرج لەدەوروبەری موسڵ ڕەوانە کرد. سوپاکەی بەرێکەوت و باجی ئەم ناوچەی کۆکردەوە.

یەعقوبییە شارییەکان لەو ناوچەیە دەژیان. فەتح کەسی بۆ لای ئەوان نارد و ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر و وتی: من کەمێك لەمەرج دەمێنمەوە ودواتر درێژە بەرێگەی خۆم دەدەم. ئەوان بەم وتەیە هێور بوونەوە و بڵاوەیان لێکرد. دەستەیەك لەوان لەنزیك یەکشەممە بازار مانەوە. فەتح بەرەبەیان هێرشی کردە سەریان و سەرکوتی کردن و دەستی بەسەر سامانەکانیاندا گرت و خەڵکەکەی بەناچاری هەڵاتن.

یەعقوبییەکانی دیکە بێ ئەوەی ئاگایان لەم جەنگە بێت هاتن و هاوەڵانیان ئەوانیان ئاگادار کردەوە. یەکیان گرت و بۆ جەنگی فەتح گەڕانەوە و شەڕیان ئەزمون کرد. هاوشێوەی یەك کەس هێرشیان کردەسەر و شکستیان پێهێنا. هەشسەد کەس لەپیاوەکانی فەتحیان کوشت. ژمارەی سوپاکەی فەتح هەزار کەس بوو. فەتح لەگەڵ سەد سەرباز هەڵات و سەد سەربازی دیکە لەگوندەکاندا بڵاو بوونەوە و خۆیان شاردەوە. دواتر هەڵاتن و بۆ موسڵ گەڕانەوە و لەوێ مانەوە.

## مەرگی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان و فەرمانڕەوای مونزەری کوڕی

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم کوڕی هوشامی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، لەکۆتایی سەفەر/ هەشتی ئۆگۆست، مرد. ژیانی ئەو شەست و پێنج ساڵ درێژەی کێشا و سی و چوار ساڵ و یانزە مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد.

ڕەنگی پێستی ئەو سوور و سپی، چوارشانە و مل کوڵ بوو. پرچی خۆی

بەخەنە و وسمە ڕەنگ دەکرد. سی و سێ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت. بیرمەند و لەهەڵە لەکارەکان خۆی بەدوور دەگرت.

کاتێك محەممەد مرد، مونزەر کوڕی محەممەدی کوڕی جێگەی گرتەوە و سێ شەو دوای مەرگی باوکی، بەیعەتیان لەگەڵ کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەجومادی الاوەل/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە لەنێوان ئیسحاق کوڕی کونداجیق و محەممەد کوڕی باوکی ساج لەڕەققە جەنگ هاتە ئاراوە و ئیسحاق شکستی خوارد. دووبارە لەمانگی زیحەججە/ ئاوریل شەڕ لەنێوان ئەوان ڕوویدا و دووبارە ئیسحاق شکستی خوارد.

لەم ساڵەدا منداڵەکانی پاشای ڕۆم دژی باوکیان ڕاپەڕین و کوشتیان. یەکێك لەمنداڵەکان جێگەی باوکی گرتەوە.

لەم ساڵەدا موەفەق، لۆلۆی کۆیلەی تولونی کە لەکاتی جەنگ لەگەڵ زەنگییەکان لەبەسرە داوای ئەمانی کردبوو، قۆڵبەست کرد و دواتر زیندانی وبارودۆخی لێ دژوار کرد و چوارسەد هەزار دیناری لێ سەند. لۆلۆ دەیوت: من جگە لەفراوانی دارایی هیچ گوناحێکی دیکەم نییە. بارودۆخی لۆلۆ بەردەوام بەرەو پەرێشانی دەڕۆشت تا ئەو جێگەی هەژار و نەدار مایەوە بێ ئەوەی هیچی بۆ بمێنێتەوە. لەکۆتایی ڕۆژگاری هارون کوڕی خەمارەویە، تەنیا لەگەڵ کۆیلەیەك بۆ میسر گەڕایەوە. ئەمەیە ئەنجامی ئەندێشەی سست و ناسپاسی.

لەم ساڵەدا هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ڕەش پێستەکانی میسر شۆڕشیان کرد و گەمارۆیان خستە سەر سەرۆکی ئاسایشی شارەکە. ئەم هەواڵە بەخەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون گەیشت و ئەو بەشمشێری دەرکێشراو سوار ئەسپەکەی بوو و ڕووی کردە ماڵی سەرۆکی ئاسایشی شارەکە. هەر ڕەشێکی بینی، کوشتی و ئەوان هەلآتن. خەمارەویە ژمارەیەکی زۆر لەڕەشەکانی کوشت و بەم شێوەیە میسر ئارام بوویەوە

و ئاسوودەیی بۆ خەڵکەکەی گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا باوکی داود سلێمان کوڕی ئەشعەسی سوجوستانی نوسەری کتێبی سنن، و محەممەد کوڕی زەید کوڕی ماجەی قەزوێنی کەئەویش بەرهەمێکی هەیە بەناوی سنن، و فەتح کوڕی شەحرەق باوکی داودی کەشی سۆفی و حەنبەل کوڕی ئیسحاق، کۆچی دواییان کرد. کەشی یەکێك لەچاکەکارەکانی ڕۆژگار و لەبەغدادمرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و چواری کۆچی ( ٨٨٧ زایینی )

### جەنگی عەمرۆ کوڕی لەیس و سوپاکەی موەفەق

لەم ساڵەدا موەفەق بۆ جەنگ لەگەڵ عەمرۆ کوڕی لەیسی سەفار، بەرەو فارس بەڕێکەوت. عەمرۆ ئاگادار بوویەوە. ئەو عەباس کوڕی ئیسحاقی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان بۆ سیراف ڕەوانە کرد. محەممەد کوڕی عەمرۆ (کوڕی خۆی) بۆ ئەرجان نارد و باوکی تەلحە کوڕی شورکەب، سوپاسالارەکەی خۆی لەگەڵ پێشەنگەکان ڕەوانە کرد. باوکی تەڵحە داوای ئەمانی لەموەفەق کرد و عەمرۆ ئاگادار بوویەوە و لەڕۆشتن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی موەفەق خۆی دواخست.

دواتر باوکی تەڵحە مەبەستی گەڕانەوە بۆ لای عەمرۆی کرد و موەفەق لەمە ئاگادار بوویەوە و لەنزیك شیراز ئەوی گرت و دارایی ئەوی بەموعتەزیدی کوڕی بەخشی و بۆ گرتنی عەمرۆ بەڕێکەوت. عەمرۆ بۆ کرمان گەڕایەوە و لەوێوە لەڕێگەی بیابانەوە ڕێگە سەجستانی گرتەبەر و محەممەدی کوڕی لەم بیابانەدا مرد. موەفەق نەیتوانی بڕواتە کرمان و سەجستان لەعەمرۆ بگرێت. بەناچاری گەڕایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بازمار ڕێگەی جەنگی گرتەبەر و ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ڕۆم و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانەکەی کوشت و تالآنی کرد و ئەسیری گرت و بێ هیچ زیانێك بۆ تەرسوس گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا سدیقی فەرغانی ڕۆشتە ناو ماڵی خەڵکانی سامەرا و ئەوەی بوویان، فڕاندی و سامانی لەبازرگانەکان وەرگرت و خراپەکاری کردە پیشە. ئەمە ئەو کەسە بوو پارێزگاری لەڕێگەکان دەکرد بەڵام دواتر خۆی بوو بەڕێگر.

لەم ساڵەدا هارون کوڕی محەممەد ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی عەباس کوڕی کەبش کوڕی متوەکیل مرد. پێشتر موعتەمیدی برای ئەوی زیندانی کرد بەڵام دواتر لەزیندان هێنایەدەر.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی موکەرەم و عەلی کوڕی عەبدولحەمیدی واستی مردن.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی کونداجیق دەستەیەکی گەورەی کۆکردەوە و رووی کردە شام. خەمارەویە ئاگادار بوویەوە. بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت کە لەفورات گوزەری کردبوو. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان دەستی پێکرد. سەرئەنجام ئیسحاق بەریسوایی شکستی خوارد کەکەس ناتوانێت قەرەبووی ئەو شکستە بکاتەوە. ئەو لەفورات پەڕییەوە و لەهەمان شوێن خۆی شاردەوە. خەمارەویە بەرەو فورات بەرێکەوت و لەوێ پردێکی هەڵبەست. کاتێك ئیسحاق لەمە ئاگادار بوویەوە، رووی کردە ئەو قەڵایانەی پێشتر ئامادەی کردبوو. کەسی بۆ لای خەمارەویە نارد و ملکەچی و گوێرایەڵی خۆی نیشاندا. خەمارەویە بەم داوایە رازی بوو.

کوڕی باوکی ساج لەگەڵ ئیسحاق ئاشتی کرد و سوپایەکی گەورەی پێکەوەنا وهێرشی کردە سەر شام تا رووبەرووی خەمارەویە ببێتەوە چوونکە شام لەمیسر دوورترین گۆڕەپانی جەنگ بوو. خەمارەویە ئەم هەواڵەی بیست. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەمیسر هاتەدەر. دوو سوپا لەبەسنییە لەدەوروبەری دیمەشق رووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕێکیماڵوێرانکەر روویدا. لەکۆتاییدا کوڕی باوکی ساج شکستی خوارد و هەڵاتوو لەفورات گوزەری کرد. خەمارەویە مناڵەکەی کوڕی باوکی ساجی (لای خەمارەویە وەك بارمتە دانرا بوو) هێنایە بارەگاکەی و خەڵات و دیاری پێبەخشی و دواتر ئازاد بۆ لای باوکی گەڕاندییەوە. خەمارەویە خۆی بۆ میسر گەڕایەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و پێنجی کۆچی ( ٨٨٨ زایینی )

### ناسازگاری خەمارەویە لەگەڵ کوڕی باوکی ساج

پێشتر ئاماژەی پێدرا کەکوڕی باوکی ساج و خەمارەویە کوڕی تولون یەکیان گرت و کوڕی باوکی ساج ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی خەمارەویە دەربڕی. بەڵام ئەمجارە کوڕی باوکی ساج دژی خەمارەویە شۆڕشی کرد. خەمارەویە لەم شۆڕشە ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەمیسرەوە هێرشی کردە سەر شام و لەکۆتایی ساڵی ٨٨٧/٢٧٤ زایینی گەیشتە ئەو دەڤەرە. کوڕی باوکی ساج ڕووبەڕووی بوویەوە و دوو سوپا لەتەنیەت لەئعتاب لەنزیك دیمەشق ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و لەموحەڕەم/ مەی ئەم ساڵە جەنگ دەستی پێکرد. لەئەنجامی ئەم جەنگە، باڵی ڕاستی خەمارەویە شکستی خوارد و پاشماوەی سوپاکەی ئەو، دەوری کوڕی باوکی ساج و سوپاکەی ئەویان گرت. کوڕی باوکی ساج هەڵات و ئوردووگاکەی و هەموو چوارپێ و کەرستەکانی ناوی، تاڵان کرا.

کوڕی باوکی ساج لەحیمس سامانی زۆری بەجێهێشتبوو. خەمارەویە فەرماندەیەکی لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکان بۆ ئەو ناوچەیە نارد. ئەم دەستەیە پێش کوڕی باوکی ساج گەیشتن و ڕێگەیان نەدا کوڕی باوکی ساج بڕواتە ناو شارەکە و دەستیان بەسەر هەموو سامانەکانیدا گرت.

کوڕی باوکی ساج هەڵات و ڕووی کردە حەلەب و لەوێوە ڕووی کردە ڕەققە و خەمارەویە لەشوێنکەوتنی ئەو بەردەوام بوو. کوڕی باوکی ساج ڕەققەی بەجێهێشت و خەمارەویە لەفورات گوزەری کرد و کوڕی باوکی ساج شوێنی کەوت. خەمارەویە گەیشتە شاری بەلەد و کوڕی باوکی ساج پێش ئەو خۆی بەموسڵ گەیاند.

کاتێك کوڕی باوکی ساج لەگەیشتنی خەمارەویە بەبەلەد ئاگادار بوویەوە، لەموسڵەوە ڕێگەی حەدیسەی گرتەبەر. خەمارەویە لەبەلەد مایەوە. بۆ ئەو تەختێکی گەورەیان بۆ ڕابواردن دروست کرد. خەمارەویە لەدیجلە لەسەر تەختەکە

دادەنیشت. ئەمە وتەی باوکی زەکەریا یەزید کوڕی ئەیاسی ئەزدی موسڵی نوسەری کتێبی مێژووی موسڵە کە: خەمارەویە گەیشتە بەلەد. ئەو پێشەوایەك بوو بیرمەند و زانا بۆ وتەکانی. نوسەری خۆی، ئەمەی لێ بینیوە.

## جەنگی نێوان کونداجیق و کوڕی باوکی ساج

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، کوڕی کونداجیق لەکوڕی باوکی ساج شکستی خوارد، خۆڕاگری کرد تا خەمارەویە شکستی بەکوڕی باوکی ساج هێنا.. کاتێك خەمارەویە ڕۆشتە ناو بەلەد، لەوێ ئوردووی لێدا و سوپایەکی گەورەی لەگەڵ ئیسحاق کوڕی کونداجیق نارد ودەستەیەك لەسەرکردەکانی خستە ژێر فەرمانی ئەو و بەمەبەستی دۆزینەوەی کوڕی باوکی ساج بەرێکەوت. کوڕی باوکی ساج دەڕۆشت و کوڕی کونداجیق بەدوایەوە تا ئەوەی گەیشتنە تکریت. کوڕی باوکی ساج لەدیجلە گوزەری کرد و کوڕی کونداجیق لەوێ مایەوە و کەشتییەکانی کۆکردەوە تا پردێك هەڵبەستێ بۆ ئەویە بتوانێت گوزەر بکات. لەم کاتەدا دوو سوپا یەکتریان تیرباران کرد.

دوو هەزار سوار هاورێیەتی کوڕی باوکی ساجیان دەکرد و کونداجیق بیست هەزار کەسی لەگەڵدا بوو. کاتێك کوڕی باوکی ساج کەشتییەکانی بینی، شەوانە لەتکریتەوە ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و لەڕۆژی چوارەم گەیشتە موسڵ و لەدەرەوەی شارەکە لەدێری ئەعلا خێوەتی هەڵدا و کوڕی کونداجیق درێژەی بەرێگە دەدا. ئەویش گەیشتە غەریق. کاتێك کوڕی باوکی ساج لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، هێرشی کردەسەر. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و لەنزیك کۆشکی حەرب جەنگی خۆیان دەست پێکرد. جەنگ قورس و محەممەد کوڕی باوکی ساج خۆڕاگری کردە پیشە چوونکە سوپاکەی کەم بوو. خواوەند هاوکاری کرد و کوڕی کونداجیق و سوپاکەی شکستیان خوارد و سوپا تێکشکاوەکە هەڵاتن و گەڕانەوە.

گەورەترین هۆکاری شکستی کوڕی کونداجیق لەخۆبایی بوونی ئەو بوو. کاتێك پێی وترا، کوڕی باوکی ساج بۆ جەنگی تۆ لەموسڵ بەرێکەوتووە، وتی: بۆ جەنگی سەگێك دەڕۆم. خەڵك ئەمەیان بەخۆپەسەندی زانی و ترس دایگرتن.

کاتێك کوڕی کونداجیق شکستی خوارد و ڕووی کردە ڕەققە، محەممەد تا ڕەققە شوێنی کەوت. دواتر نامەیەکی بۆ باوکی ئەحمەد موەفەق نووسی و لەوەی ڕوویدابوو، ئاگاداری کردەوە. داوای مۆڵەتی لەموەفەق کرد تا لەفوراتەوە بەرەو شام- سنوری خەمارەویە- گوزەر بکات. موەفەق وەڵامی دایەوە و سپاسی کرد و فەرمانی مانەوە لەو شوێنەی پێدا تا هێزە پشتیوانەکان بگەن.

کوڕی کونداجیق ڕۆشتە لای خەمارەویە و خەمارەویە سوپایەکی لەگەڵدا نارد. ئەوان گەیشتنە فورات. شام لەژێر فەرمانی ئیسحاق کوڕی کونداجیق و ڕەققە لەژێر فەرمانی کوڕی باوکی ساجدا بوو. ئەو چەند کەسێکی لەفورات دانابوو تا ڕێگری لەپێشڕەوی دوژمن بکەن. ئەوان بۆ ماوەیەك لەو شوێنە مانەوە.

لەم کاتەدا کوڕی کونداجیق فەرمانی پێشڕەوی بەدەستەیەك لەسەرکردەکاندا تا جیاواز لەو شوێنەی پاسەوانی بۆ دانرابوو، لەفورات بپەڕنەوە. ئەم سەربازانە کەلای سوپاکەی کوڕی کونداجیق بوون، بەشێوەیەکی نهێنی لەوێ گوزەریان کرد و ڕووبەڕووی سەربازەکانی کوڕی باوکی ساج بوونەوە و ژمارەیەك لەسەربازەکانی کوڕی باوکی ساج بۆ ڕەققە هەڵاتن. کاتێك کوڕی باوکی ساج ئەمەی بینی، لەڕەققەوە ڕێگەی موسڵی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە موسڵ، لەدانیشتوانی ئەو شارە داوای هاوکاری مادی کرد و وتی: مرۆڤی ناچار، جوامێرێك ناناسێت. یەك مانگ لەوێ مایەوە و دواتر ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەرەبیع الاوەلی ٢٧٦/ جولای ٨٨٩ زایینی پەیوەستی باوکی ئەحمەد موەفەق بوو. موەفەق ئەوی لەگەڵ خۆی بۆ کوێستانەکانی کوردستان و لورستان برد و دیاری و خەڵاتی پێ بەخشی. کوڕی کونداجیق لەدیاری ڕەبیعە و موزێر لەسەرزەمینی جەزیرە مایەوە.

## جەنگی نێوان تائی و فارسی عەبدی

لەم ساڵەدا فارسی عەبدی دەرکەوت و ڕێگەکانی گرت و ڕووی کردە شاری سامەرا و تاڵانی کرد. تائی بۆ جەنگی ئەو خۆی ئامادە کرد و شکستی پێهێنا و دەستی بەسەر خێوەت و باروبنەکەیدا گرت. دواتر تائی ڕووی کردە دیجلە تا لەوێ گوزەر بکات. سوار بەلەمێکی بوو بەڵام دەستەیەك لەهاوەڵانی فارس پێی

گەیشتنەوە و خۆیان بەدواوەی کەشتییەکەیەوە هەڵواسی. تائی خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە و بەمەلە خۆی گەیاندە وشکی. کاتێك لەئاوەکە هاتەدەر، ئاوی ڕیشی خۆی گرت و وتی: عەبدی گومانی چی دەکات.؟ ئایا لەماسی مەلەوانتر نیم؟ دواتر تائی لەسن سوپای رازاندەوە و عەبدی لەبەرابەر ئەو. عەلی کوڕی بیستام ئەم هۆنراوەی سەبارەت بەتائی هۆنیوەتەوە:

قد اقبل الطائی ما اقبلا　　　　یفتح فی الافعال ما اجملا

کانه من لین الفاظه　　　　صیبة تمضع جهد البلا

واتاکەی: تائی هات، چ هاتنێك کەدەرگای کارە چاکەکانی کردەوە، دەتوت لەنەرمی وشەکان کیژێکە کەجوهد ئەلبلا[١٥] دەجوێت.

لەم ساڵەدا موەفەق تائی گرت و زیندانی کرد و دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت. ئەو کوفە، سواد (عێراق) ڕێگەی خوراسان، سامەرا، ئاسایشی بەغداد، باجی بادوریا، قوتەربول و مەسکەنی لەژێر فەرمانددا بوو.

## گرفتاری موعتەزید بالله بەدەستی باوکی موەفەق

لەشەوال/ فەوریەی ئەم ساڵە موەفەق، کوڕەکەی موعتەزید بالله باوکی عەباسی ئەحمەدی دەستگیر کرد.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو ئەو ڕۆشتە واست و لەوێ ئوردووی لێدا و ماوەیەك دواتر، گەڕایەوە و موعتەمید عەلی الله لەمەدائن مایەوە. فەرمانی بەکوڕەکەیدا بەرەو کەنارەکان بەرێکەوێت بەڵام ئەو سەرپێچی کرد و وتی: تەنیا بۆ شام دەڕۆم چوونکە سەروەری باوەڕداران منی وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە دەستنیشان کردووە. کاتێك موعتەزید سەرپێچی کرد، موەفەق فەرمانیدا ئەو بێننە بارەگاکەی. کاتێك هات، فەرمانی بەژمارەیەك لەخزمەتکاراندا لەژوورێکی ماڵەکەی خۆی زیندانی بکەن. کاتێك موعتەزید هەستا، خزمەتکارێك ڕۆشتە لای و فەرمانی پێدا بڕواتە یەکێك لەژوورەکان. موعتەزید ڕۆشتە ژوورێك و پاسەوانی بۆ دانرا.

---

[١٥] - جۆرێك شت بووە کەدەجاورا هاوشێوەی بنێشتی ئەمڕۆیی. (وەرگێڕ)

سەرکردەکانی هاورێی موعتەزید شۆڕشیان کرد و شمشێریان دەرهێنا و بەغدادییەکان کاتێك سەرکردەکان و شمشێر بەدەستەکانیان بینی، ترسان. موەفەق هاتە ناو شارەکە و وتی: ئێوە چیتان بەسەر دێت؟ ئایا گومان دەکەن لەمن بۆ منالەکەم میهرەبانترن؟ خۆم بەپێویستم زانی ناڕاستییەکانی ئەو ڕاست بکەمەوە. خەڵکان بلأوەیان لێکرد.

لەم ساڵەدا تائی ڕۆشتە سامەرا. ئەو لەوێ هاورێی بوو. نامەی بۆ هاورێکەی نووسی وئەمانی وەرگرت و لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی ڕووی کردە سامەرا. تائی هاوەڵانی هاورێکەی گرت و دەست وپێی ئەوانی بەپێچەوانەوە بڕی و جەستەی ئەوانی ڕەوانەی بەغداد کرد.

لەم ساڵەدا بازمار جەنگی دەریایی ئەنجامدا و چوار کەشتیی لەرۆمییەکان سەند.

## زاڵبوونی رافیع کوڕی هەرسیمە لەجورجان

لەم ساڵەدا رافیع کوڕی هەرسیمە هێرشی کردە سەر جورجان و محەممەد کوڕی زەیدی لەوێ دەرپەڕاند. محەممەد ڕۆشتە ئیستر ئاباد و رافیع لەوێ ناکاوگیری کرد و نزیکەی دوو ساڵ لەوێ مایەوە. لەم کاتەدا نرخی کەل و پەلەکان بەرادەیەك بەرز بوویەوە کەخواردەمەنی بۆ خواردن دەست نەدەکەوت و یەك درهەم[١٦] خوێ بەدوو درهەم زێر دەفرۆشرا. محەممەد کوڕی زەید شەوانە لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی ڕێگەی ساری گرتەبەر. رافیع سوپایەکی ڕەوانە کرد و لەنێوان دوو سوپا جەنگ ڕوویدا. محەممەد ساری بەجێهێشت و لەتەبەرستان ڕۆشتەدەر. ئەم پێشهاتە لەمانگی رەبیع الاوەلی ٢٧٧/ جونی ٨٩٠ زایینی ڕوویدا. لەم کاتەدا رۆستەم کوڕی قارن لەتەبەرستان داوای ئەمانی لەرافیع کرد و کوڕی قولە بوو بەزاوای رافیع.

کاتێك رافیع لەتەبەرستان بوو، عەلی کوڕی لەیس ڕووی کردە ئەو دیارە و

[١٦]– درهەم لێرەدا پێوانەی کێشە نەك پێوانەی پارە. (وەرگێڕ)

پەنای بۆ برد چوونکە عەمرۆی برای ئەوی لەکرمان دەستەبەسەر کردبوو. عەلی کوڕی لەیس بیری لەرێگە چارەیەك کردەوە تا توانی خۆی و دوو کوڕەکەی موعەدەل و لەیس رزگار بکات و پەیوەستی رافیع ببێت.

رافیع، محەممەد کوڕی هارونی وەك نوێنەری خۆی بۆ فەرمانڕەوایەتی چالوس نارد. لەویٚ عەلی کوڕی کالی داوای ئەمانی کرد و پەیوەستی محەممەد کوڕی هارون بوو. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی زەید لەرێگەوە گەیشت و لەو شارە گەمارۆی خستە سەر هەردووکیان و رێگەی لیٚ بەستن. چیتر هەواڵی ئەم دووانە بەرافیع نەدەگەیشت. کاتێك هەواڵەکانی ئەو نەهات، رافیع سیخوڕێکی نارد تا لەبارودۆخی ئەوان ئاگاداری بکاتەوە. سیخوڕ گەڕیاەوە و رافیعی لەگەمارۆدرانی ئەو دوانە بەدەستی محەممەد کوڕی زەید لەچالوس ئاگادار کردەوە. ئەم هەواڵە بۆ رافیع دژوار و بۆ هاوکاری ئەو دوانە بەرێکەوت. محەممەد کوڕی زەید دەستی لەو دوانە هەڵگرت و رووی کردە دەیلەم. رافیع بەدوای ئەو رووی کردە دەیلەم و رێگەکانی بڕی و گەیشتە سنوورەکانی قەزوێن وبۆ ڕەی گەڕایەوە و لەهەمان شار مایەوە تا ئەوەی لەرەجەب/ ٢٧٦/ ئۆکتۆبەری ٨٨٩ زایینی ماڵئاوایی لەژیان کرد.

## مەرگی مونزەر کوڕی محەممەدی ئومەوی

لەموحەرەم/ مەی ئەم ساڵە، مونزەر کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حەکەم کوڕی هوشامی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، کۆچی دوایی کرد. دەستەیەك مەرگی ئەو بۆ مانگی سەفەر/ جون دەگێڕنەوە. فەرمانڕەوایی ئەو یەك ساڵ و یانزە مانگ و دە رۆژ درێژەی کێشا. ساڵەکانی ژیانی لەچل و شەش کۆتایی پێهات. ئەو گەنم رەنگ، بالاٚ بەرزو ئاوڵە روخسار بوو، قژی لوول و ڕیشی پڕ و درێژ بوو. شەش کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت. ئەو بەخشندە و ئارەزوومەندی هۆنراوە بوو. پاداشتی بەشاعیرەکان دەدا.

کاتێك مونزەر مرد، هەمان رۆژی دەستی براکەی، عەبدوللە کوڕی محەممەدیان وەك بەیعەت گرت. نازناوی ئەو باوکی محەممەدە. دایکی دایکی منالٚ و بەعەشار ناویان دەبرد. ئەو ساڵێك پێش کوڕەکەی کۆچی دوایی کردبوو. لەرۆژگای مونزەر

ئاژاوە ئاندۆلۆسی گرتبوویەوە و هەر ناوچەیەك لەژێر فەرمانی کەسێکدا بوو. لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو بارودۆخی ئاندۆلۆس بەم شێوە بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی حەجاجی مەروروودی کەهاوڕێی ئەحمەد کوڕی حەنبەل بوو و عەبدوللە کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاقی عەتاری موسڵی تەمیمی کەژمارەیەکی زۆری حەدیسی گێڕاوەتەوە و لای فەرمانڕەواکان بەکەسێکی ڕاستگۆ دادەنرا، مردن.

لەم ساڵەدا باوکی سەعید حەسەن کوڕی حسەین کوڕی عەبدوڵلەی بەکری نەحوی کەنوسەری چەندین کتێبە، مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو ٨٨٣/٢٧٠ زایینی دەزانن کەراستتر بەرچاو دەکەوێت.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و شەشی کۆچی ( ٨٨٩ زایینی )

لەم ساڵەدا ئاسایشی بەغداد بەعەمرۆ کوڕی لەیس سپێردرا و ناوی ئەو لەسەر ئاڵاکان و قەڵغانەکان و شتی دیکە نووسرا. ئەمە لەمانگی شەوال/ ژانویەدا بوو. عەمرۆ، عوبەیدالله کوڕی عەبدولله کوڕی تاهیری وەك جێگری خۆی وەك سەرۆکی ئاسایشی بەغداد دیاریکرد. عەمرۆ لەمانگی شەوال/ ژانویەی ئەم ساڵە فەرمانی بەعوبەیداللەدا ناوی ئەو لەسەر ئاڵا و شتەکانی دیکە بسڕێتەوە.

لەنیوەی ڕەبیع الاوەل/ هەژدەی ئۆگۆستی ئەم ساڵە، موەفەق ڕۆشتە کوێستانەکانی کوردستان و لورستان چوونکە مازەرائی دەبیرەکەی ئەزکوتکین ئاگاداری کردبوویەوە کەسامانێکی زۆر لەو ناوچەیە کۆبۆتەوە و ئەگەر موەفەق بەرەو ئەو دیارە بڕوات، دەتوانێت دەست بەسەر هەموو سامانەکەدا بگرێت. موەفەق ڕۆشت بەڵام سامانی دەست نەکەوت و لەبەر ئەوەی هیچی دەست نەکەوت ڕێگەی کەرەج و دواتر ئیسفەهانی گرتەبەر تا ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دوڵف گرفتار بکات. ئەحمەد لەگەڵ سوپا و بنەماڵەکەی خۆی لەوێ ڕۆشت و فەڕشی ماڵەکەی هەڵنەگرت بۆ ئەوەی ئەگەر موەفەق هات، لەناو ماڵێکی چۆڵ دانەنیشێت.

لەم ساڵەدا موەفەق، کوڕی باوکی ساجی وەك فەرمانڕەوای ئازەربایەجان دەستنیشان کرد و کوڕی باوکی ساج بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت. عەبدولله کوڕی حەسەنی هەمەدانی، فەرمانڕەوای مەراغە، ڕووبەرووی بوویەوە تا ڕێگەی نەدات بڕواتە ئازەربایەجان. کوڕی باوکی ساج لەگەڵ عەبدولله جەنگی و عەبدولله شکستی خوارد و ئاکاوگیر کرا و لەساڵی ٨٩٣/٢٨٠ شارەکەی لێ سەند. کوڕی باوکی ساج فەرمانڕەوایەتی خۆی لەو شارە دەست پێکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی حیماد کوڕی ئیسحاق کوڕی حیماد کوڕی یەزیدی قازی مرد.

هەروەها لەم ساڵەدا کارگوزاری کوڕی کونداجیق لەموسڵ یەکێك لەخەواریجی بەناوی نەعیم کوشت. هارون پێشەوای خەواریج ئەمەی بیست. ئەو کە لەحەدەیسەی موسڵ بوو، هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و مەبەستی جەنگ

لەگەڵ دانیشتوانی شارەکەی کرد. لەبەر ئەمە لەرۆژئاوای دیجلە ئوردوی لێدا. خەڵکانی موسڵ گەورەکان وریبەرەکانی خۆیان بۆ لای هارون نارد و سەبارەت بەهاتنەکەی پرسیاریان کرد. هارون وەلامی دایەوە: کوژرانی نەعیم ئێمەی گەیاندۆتە ئێرە. وتیان: کارگوزاری فەرمانڕەوا ئەوی کوشتووە و ئێمە لەکوشتنی ئەو بێ تاوانین. ئەوان داوای ئەمانیان لەهارون کرد تا هەموویان بڕۆنە لای و داوای بەخشین بکەن و بێزاری خۆیان لەکوژرانی نەعیم دەربڕن. هارون ئەمانی پێبەخشین. دەستەیەك لەخەڵکانی موسڵ لەگەڵ گەورەکانیان هاتنە لایان و بێزاری خۆیان لەکوژرانی نەعیم دەربڕی. بەم شێوەیە هاورن لێیان خۆش بوو و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا حاجییەکانی یەمەن لەمەککە گەڕانەوە و ڕۆشتنە ناو دۆڵێك. بەلاَ لافاوێکی مەترسیدار هات و هەموویانی لەگەڵ خۆی برد.

لەم ساڵەدا باوکی قولابە عەبدولمەلیك کوڕی محەممەدی رەقاشی بەسرە کۆچی دوایی کرد. ئەو لەبەغداد مابوویەوە.

لەم ساڵەدا هەواڵ هات کەتەپۆڵکەیەك لەکەنار رووباری بەسرە بەناوی شەقیق داڕماوە و ڕژاوەتە ناو ئاو و حەوت گۆڕ و حەوت جەنازەی لەژێردا دەرکەوتووە. هەر گۆڕێك هاوشێوەی حەوزێك لەبەردی مەڕمەڕ بەرەنگی مس دروست کراو و داتاشراوە و لەسەر هەرکام لە مردووەکان کتێبێك بوو کەدەرنەکەوت چی تیا نووسراوە. کفنەکانیان هێشتا تازە وبۆنی موشکی لێدەهات. یەکێك لەوان گەنجێك بوو، قژ درێژ لێوی بەشێوەیەك تەڕ بوو وەك بڵێی تازە ئاوی خواردبێتەوە و وای نیشان دەدا سورمە لەچاوانی کردبێت. برینێك لەکەلەکەی ئەودا دەبینرا. لەم ساڵەدا هارون کوڕی محەممەدی هاشمی ریَ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی محەممەد عەبدوللە کوڕی موسلیم کوڕی قوتەیبە، نوسەری کتێبی ئەدەب ئەلکاتب و کتێبی المعارف، مرد. ئەو خەڵکی کوفە بوو. بەدینەوریش ناویان بردووە چوونکە قازی دینەوەر بو. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بە ٨٨٣/٢٨٠ زایینی دەزانن. باوکی سەعید حەسەن کوڕی حسەین کوڕی عەبدوللەی یەشکوری، نەحوی، راوی، لەم ساڵەدا مرد. ساڵی لەدایك بوونی ئەو ٧٢٧/٢١٢ زایینیە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی باوکی جەعفەری قەسابی سۆفی لەهاودەمەکانی سەری و جونەید، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و حەوتی کۆچی (٨٩٠ زایینی)

لەم ساڵەدا بازمار لەتەرسوس بەناوی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون وتاری خوێندەوە چوونکە خەمارەویە سی هەزار دینار و پێنسەد دەست جل و پێنسەد عابا و کەرەستەی جەنگی فراوانی بۆ نارد و کاتێك بازمار دیارییەکانی بەدەست گەیشت، بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە و بەم شێوەیە خەمارەویە پەنجا هەزار دیناری دیکەی بۆ نارد.

لەرەبیع الاوەل/ جولای ئەم ساڵە لەنێوان وەسیف، خزمەتکاری کوڕی باوکی ساج و بەربەرییەکانی هاوڕێی باوکی سەقەر ئاژاوە ڕوویدا و دەستیان بەکوشتاری یەك کرد. لەهەر دوو سوپا ژمارەیەك کوژران. ئەم جەنگە لەکەنار دەروازەی شام ڕوویدا. باوکی سەقەر سوار ئەسپ بوو و ئەوانی لەیەك جیا کردەوە.

لەم ساڵەدا، ئەرکی لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی ستەملێکراوان بەیوسف کوڕی یەعقوب سپێردرا. ئەو فەرمانیدا جاڕ بدەن هەرکەس لەلایەن ناسر ئەلدین الله موەفەق یا هەر کەسێکی دیکە ستەمی لێکراوە، بێتە پێش.

لەشەعبان/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە یەکێك لەسەرکردە گەورەکانی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

هارون کوڕی محەممەد کوڕی عیسای هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی جەعفەر ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی باوکی موسەنای موسڵی کەحەدیسی زۆری دەگێڕایەوە و لەبڕواپێکراوەکان بوو، مرد.

لەم ساڵەدا باوکی حاتەمی ڕازی بەناوی محەممەد کوڕی ئیدریس کوڕی مونزەر، مرد.

لەم ساڵەدا یەعقوب کوڕی سوفیان کوڕی حەوانی سەری لەشیعەکان و یەعقوب کوڕی مەعقەلی ئومەوی باوکی باوکی عەباس ئەسەم، هەردووکیان مردن.

لەم ساڵەدا عورەیبی گۆرانیبێژ، گۆرانیبێژی مەئمون کەهەندێك ئەو بەکچی جەعفەر کوڕی یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك دەزانن، مرد. لەساڵی ١٨١/٧٩٧

زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی سەعیدی خەراز بەناوی ئەحمەد کوڕی عیسا مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بۆ ٨٩٩/٢٨٦ زایینی دەگێڕنەوە کەگێڕانەوەی یەکەم راستتر بەرچاو دەکەوێت.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و شەشی کۆچی ( ٨٩١ زایینی )

### شۆڕشی بەغداد

لەم ساڵەدا لەبەغەداد لەنێوان هاوەڵانی وەسیفی خزمەتکار و بەربەرییەکان و هاوەڵانی موسا خوشکەزای موفلیح، جەنگ ڕوویدا کە لەمانگی موحەرەم/ ئاوریل چوار ڕۆژ درێژەی کێشا و دواتر هەردوولا بەئاشتی ڕازی بوون. دەستەیەك لەهەردوولا کوژران و بەدوای ئەمە لەبەشی ڕۆژهەڵاتی بەغداد لەنێوان هاوەڵانی یونس شەڕ ڕوویدا کەپیاوێك لەو ناوەدا کوژرا. دواتر هەموویان گەڕانەوە.

### چۆنیەتی مەرگی موەفەق

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد موەفەق باللە کوڕی متوەکیل گیانی سپارد.

ئەو لەکوێستانی لورستان نەخۆش کەوت و کاتێك ئازار تەنگی پیێ هەڵچنی، مەبەستی گەڕانەوەی کرد بەڵام نەیتوانی سوار ئەسپ ببێت. تەختێکی بۆ دروست کرا کەسەرەکەی داپۆشرابوو. ئەو لەگەڵ خزمەتکارەکەی لەسەر تەختەکە دادەنیشت و خزمەتکار باوەشێنی قاچەکانی دەکرد و هەندێ کات بەفری دەخستەسەر. دواتر قاچی گرفتاری (دا ئەلفیل) بوو (ئاوسانی قولاپەی پێیە کەبەردەوام ئاوی لێ دێتەدەر. چل کەس بەردەوام تەختەکەی ئەویان لەسەر شان دەبرد. موەفەق ڕۆژێك پێی وتن: لەوەی من لەسەر شانی خۆتان هەڵدەگرن، بێزار بوون، حەزم دەکرد وەك یەك لەئێوە بارێکم لەسەر شان بوایە بەڵام توانای خواردن و جەستەیەکی تەندروستم هەبوایە. ڕۆژێك لەکاتی نەخۆشییەکەی وتی: دیوانەکەی من ڕۆژانە بەسەد هەزارکەس دەدات بەڵام کەس لەناو ئەوان لەمن زیاتر بارودۆخی پەرێشانتر نییە.

ئەو لەدووی سەفەر/ حەفدەی مەی گەیشتە کۆشکەکەی خۆی. کاتێك باوکی سەقەر لەکۆشکەکەی گەڕایەوە، هەواڵی مەرگی ئەو لەسەر زاران بڵاو بوویەوە و

باوکی سەقەر فەرمانیدا باوکی عەباس لەزینداندا بهێڵنەوە و دەرگاکانیان لەسەر داخست. هەواڵی مەرگی موەفەق بلاّو بوویەوە. موەفەق بیّ هۆش ببوو. باوکی سەقەر کەسی بۆ مەدائین نارد تا موعتەمید و منالەکانی بێنن. ئەوانیان هێنایە کۆشك و باوکی سەقەر چیتر نەڕۆشتە کۆشکەکەی موەفەق.

کاتێك بەندەکانی باوکی عەباس و فەرماندەکانی ئەو، بارودۆخی باوکی عەباسیان بینی، کێلونەکانی دەرگاکانیان شکاند و دەرگاکانیان کردەوە. باوکی عەباس کاتێك دەنگی ئاژاوەی بیست، گومانی کرد مەبەستی کوشتنی ئەویان هەیە، شمشێری هەڵگرت و بەبەندەکەی تەنیشت خۆی وت: سوێند بەخوا تا گیان لەجەستەمدا بێت، دەستیان بەمن ناگات. کاتێك ئەوان گەیشتن، لەپێش هەموویانەوە کۆیلەکەی خۆی، وەسیفی مشك گری بینی و بەبینینی ئەو شمشێرەکەی لەدەست کەوتە خوار و زانی تەنیا چاکەی ئەویان دەوێت. باوکی عەباسیان هێنایەدەر و لای باوکی دایاننیشاند. کاتێك موەفەق چاوی کردەوە، باوکی عەباسی لای خۆی بینی و ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە.

باوکی سەقەر، سەرکردەکان و سوپاکەی دەوری خۆی کۆکردەوە و فەرمانیدا و دوو پردەکەی بەغدادیان بڕی. لەبەشی ڕۆژهەلاّت، دەستەیەك ڕووبەرووی بوونەوە و ژمارەیەك لەهەردوولا کوژرا. بەدوای ئاگادار بوونی خەڵکان لەزیندوو بوونی موەفەق، محەممەد کوڕی باوکی ساج لەباوکی سەقەر جیابوویەوە و هاتە لای موەفەق. سەرکردەکان و خەڵکانیش کەم کەم لەباوکی سەقەر دابڕان. باوکی سەقەر کاتێك بارودۆخی بەم شێوەیە بینی، لەگەڵ کوڕەکەی هاتە کۆشکی موەفەق بەلاّم موەفەق بۆ ئەم ڕووداوە هیچی پیّ نەوت. ئەو لەکۆشکی موەفەق مایەوە. کاتێك موعتەمید مانەوەی ئەوی لەکۆشکی موەفەق بینی، لەگەڵ کوڕەکانی خۆی و بەکتەمەر سوار بەلەمێك بوو. لەم کاتەدا ڕووبەروی بەلەمی باوکی لەیلی کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف بوونەوە. ئەو، ئەوانی سوار کرد و بۆ ماڵی عەلی کوڕی جەهشیاری بردن.

دوژمنانی باوکی سەقەر وتیان ئەو دەخوازێت بەسامانی موەفەق، خۆی لەموعتەمید نزیك بکاتەوە و ئەم قسەیان لەناو هاوەلاّنی موەفەق بلاّو کردەوە. بەم

شێوەیە ماڵی باوکی سەقەر تالآن کرا و ژنەکانی پێ پەتی و بێ چارشێو لەماڵەکانیان دەرکران. ماڵەکانی دەوروبەریش تالآن کرا. دەرگای زیندانەکان شکێنران و زیندانییەکان هاتنەدەر.

موەفەق هەم خەلآتی بەباوکی عەباسی کوڕیدا هەم بەباوکی سەقەر. هەردووك سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون. باوکی عەباس بەرەو ماڵەکەی خۆی و باوکی سەقەر بەرەو ماڵە تالآن کراوەکەی. باوکی سەقەر بوریایەکی بەقەرز وەرگرت تا لەسەری دانیشێت. باوکی عەباس، بەدری کۆیلەی خۆی وەك سەرۆکی ئاسایش دەستنیشان کرد و محەممەد کوڕی غانەم کوڕی شای وەك نوێنەری خۆی لەبەشی رۆژهەلآت دانا.

موەفەق لەرۆژی چوارشەممە بیست و دووی سەفەر/ هەشتی جونی ئەم ساڵە مرد و شەوی پێنجشەممە لەروسافە بەخاك سپێردرا و باوکی عەباس پرسەی بۆ گێڕا.

موەفەق دادپەروەر و چاکەکار بوو. لەگەڵ قازییەکان بۆ دادوەری دادەنیشت و دادی خەڵکانی لەیەك وەردەگرت. شارەزای ئەدەب و رەچەڵەك ناس بوو. زانستی فیقه و بەرێوبەردنی وڵاتی دەزانی. رۆژێك بەهاوەلآنی خۆی وت: باوەگەورێم عەبدولله کوڕی عەباس وتوویەتی: ئەگەر زەردەواڵەیەك بەسەر جەستەی کەسی تەنیشتم دەنیشتەوە، من ئازارم دەبینی، و ئەمە ترۆپکی رێزداری ئەوە. منیش سوێند بەخوا بەهەمان چاو سەری هاونیشینەکانی خۆم دەکەم کەسەیری براکانم دەکەم و ئەگەر دەمتوانی ناوی ئەوانم لەهاونشین بۆ هاورێ و لەهاورێ بۆ برا دەگۆری.

یەحیا کوڕی عەلی دەڵێت: رۆژێك موەفەق هاونشینەکانی خۆی بانگ کرد. من پێش کەسانی دیکە ڕۆشتمە لای. کاتێك بەتەنیا منی بینی، وتی:

و استصحب الاصحاب حتی اذا دنوا          و ملوا من الادلاج جئتکم وحدی

واتاکەی: لەگەڵ هاوەلآنی خۆم دادەنیشم و کاتێك ئەوان بێن و لەشەونشینی بێزار بن، تەنیا دێم بۆ لای ئێوە.

سپاسم کرد و بەباشترین شێوە وەسفی ئەوم هێنایە سەرزمان.

چاکەکارییەکانی بەرادەیەك فراوانن لەم کتێبەدا جێگەی نابێتەوە.

## بەیعەت لەگەڵ موعتەزید بۆ جێگری

کاتێك موەفەق مرد، سەرکردەکان کۆبوونەوە و بەیعەتیان لەگەڵ کوڕەکەی باوکی عەباس وەك خەلیفە دوای مفوەز کوڕی موعتەمید کرد و نازناوی موعتەزید باللەیان پێ بەخشی. لەرۆژی هەینی دوای مفوەز بەناوی ئەو وتار خوێنراەوە. ئەم بەیعەتە لەرۆژی بیست و سێی سەفەر/ شەشی جون بەسترا. هاوەڵانی باوکی هەموو لەدەوری کۆبوونەوە. هەموو ئەرکەکانی باوکیان خستە سەر شانی ئەو.

لەم ساڵەدا موعتەمید، باوکی سەقەر و هاوەڵانی گرت و ماڵی ئەوانی تاڵان کرد. ئەو شوێنپێی منداڵەکانی فوراتی هەڵگرت بەڵام ئەوان خۆیان شاردەوە. موعتەمید خەڵاتی بەعوبەیداللە کوڕی سلێمان کوڕی وەهب بەخشی و جل و بەرگی وەزیری لەبەر کرد و محەممەد کوڕی باوکی ساجی بۆ واست نارد تا کۆیلەکەی ئەو، وەسیف بۆ بەغداد بگەڕێنێتەوە. وەسیف ڕێگەی شوشی گرتەبەر و لەوێ خراپەکاری کردە پیشە و هەموو کاڵا بەنرخەکانی تاڵان کرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی لەیس برای سەفار بەشمشێری رافیع کوڕی هەرسیمە کوژرا چوونکە ڕقی ئەوی لەدڵدا بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا عەلی براکەی خۆی بەجێهێشتبوو.

لەم ساڵەدا ئاوی نیل دابەزی و نرخی کەل و پەل لەمیسر بەرز بوویەوە.

## سەرەتای کاری قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا لەدەوروبەری کوفە دەستەیەك کەوتنە جموجۆڵ کە بەقەرەمتییەکان ناسران. وەك دەڵێن سەرەتای دەرکەوتنی ئەوان بەم شێوە بوو: پیاوێك لەوان لەکەنارەکانی خوزستانەوە هاتە دەوروبەری کوفە و لەشوێنێك مایەوە بەناوی نەهرەین. ئەو خواپەرەستی و خۆپارێزی کردە پیشە، بوریای دەچنی و لەڕەنجی شانی خۆی نانی دەخوارد و بەردەوام سەرقاڵی نوێژ خوێندن بوو. ماوەیەك

درێژەی بەم کارانەیدا و ئەگەر پیاوێك لایەوە دادەنیشت، پێشنیاری خواپەرەستی و چاکەکاری پێدەکرد و دەیوت نوێژە فەرزەکان لەسەر خەڵکان پەنجا رەکعەتە. ئەمە کەوتە سەرزاران و دواتر وتی بانگەواز بۆ پێشەوایەتی یەکێك لەبنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) دەکات. ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا ئەوەی شوێنکەوتەکانی زیادیان کرد.

لەوێ لای میوە فرۆشێك دادەنیشت. رۆژێك دەستەیەك هاتنە لای کابرای میوە فرۆش و سۆراغی پیاوێکیان کرد تا خورما کۆکراوەکانیان بۆ بپارێزێت. میوە فرۆش ئەم پیاوەی پێناساندن و وتی: ئەگەر رازی ببێت پارێزگاری لەخورماکانی ئێوە بکات، بەو شێوەیە دەبێت کەخوازیارن پێی. قسەیان لەگەڵ کرد و ئەو لەبەرابەر وەرگرتنی چەند درەمێك بەپێشنیارەکەیان رازی بوو. ئەو پارێزگاری لەخورماکانی ئەوان دەکرد و رۆژەکانی بەنوێژ و رۆژوو بەسەر دەبرد. لەکاتی ئاوابوونی هەتاو برێك خورمای لەکابرای میوەفرۆش دەکڕی و رۆژووەکەی دەشکاند و دەنکی خورماکانی کۆدەکردەوە و دەیدا بەکابرای میوەفرۆش. کاتێك بازرگانەکان خورماکەی خۆیان برد، کرێی ئەم پیاوەیان لای کابرای میوەفرۆش پێدا. ئەو پیاوە ئەو برەی خورمایەی لەکابرای میوە فرۆشی کڕیبوو، بژاردی و بەهای دەنووەکانی لێ کەم کردەوە. بازرگانەکان ئەمەیان بیست و لێیاندا و وتیان: ئایا خواردنی خورماکانی ئێمە بەشی نەکردی کەدەنووەکانیشت فرۆشت؟ کابرای میوە فرۆش رێگەی نەدان چیتر زیاتر قسە بکەن و راستییەکانی بۆ باس کردن. ئەوان لەکارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و داوای بەخششیان لێکرد. ئەوانی بەخشی. کاتێك خەڵکی گوندە لەخۆپارێزی ئەو ئاگادار بوونەوە، پێگەی ئەویان بەبەرز هەست پێکرد.

دواتر نەخۆش کەوت و بۆ ماوەیەك لەسەر جێگە کەوت. لەو گوندەدا پیاوێکی چاوسور دەژیا کەبەمانگاکانی خۆی باری دەبرد. ئەم پیاوەیان لەبەر سوری چاوی بەکەرمیتە ناو دەبرد کە بەنەبتی بەپیاوی سورچاو دەڵێن. میوەفرۆش لەگەڵ کەرمیتە قسەی کرد و داوای لێکرد ئەم نەخۆشە بباتە ماڵەکەی خۆی و تیماری بکات. کەرمیتە ئەوکارەی کرد. پیاو لەماڵی ئەودا مایەوە تا تەندروستی خۆی

بەدەست هێنایەوە. لەم کاتەدا ئەم پیاوە پێشنیاری شوێنکەوتنی ئایینەکەی خۆی بەخەڵکان کرد و ژمارەیەك شوێنی کەوتن. ئەو لەشوێنکەوتەکانی خۆی یەك دیناری وەردەگرت و دەیوت ئەمە ماف پێشەوایە (ئیمام) لەناو ئەم خەڵکە دوانزە سەرکردەی هەڵبژارد و داوای لێکردن پێشنیاری پەیوەست بوونی خەڵکان بەم ئایینە بکەن و پێی وتن: ئێوە هاوشێوەی حەوارییەکانی عیسا کوڕی مریەمن. دانیشتوانی ئەم گوندانە بەو شێوەیە نوێژیان دەخوێند کەئەم پیاوە فێری کردبوون.

هەیسەم لەو دیارەدا خاوەنی زەوی کشتوکاڵی بوو. ئاگادار بوویەوە وەرزێرەکان لەکاری ئاوەدان کردنەوەی زەوییەکانی کەمتەرخەمی دەکەن. دەستی بەلێکۆڵینەوە کرد. خەڵکان هەیسەمیان لەبەسەرهاتی ئەو پیاوە ئاگادار کردەوە. هەیسەم ئەوی گرت و زیندانی کرد و کاتێك لەئایینەکەی ئاگادار بوویەوە، سوێندی خوارد بێ گومان دەیکوژێت. فەرمانیدا لەژورێکدا دەستبەسەری بکەن. کلیلی ژوورەکەی لەژێر سەرینەکەی خۆی دادەنا و سەرقاڵی خواردنەوە بوو. یەکێك لەکەنیزەکانی ئەو لەماڵەکە، بەسەرهاتی ئەم پیاوەی بیست و بەزەیی پیایدا هاتەوە و کاتێك هەیسەم خەوت، کلیلەکەی هەڵگرت و بەرگای ژوورەکەی کردەوە و ئەو پیاوەی رزگار کرد. دواتر کلیلەکەی لەشوێنەکەی خۆی دانایەوە. بۆ بەیانی، هەیسەم دەرگای ژوورەکەی کردەوە تا بیکوژێت بەڵام ئەوی نەبینی.

ئەم رووداوە لەناو خەڵکان بڵاو بوویەوە و خەڵکانی ئەو دیارە شەیدای ئەم پیاوە بوون و وتیان بۆ ئاسمان بەرز کراوەتەوە. ئەو دوای ئەم پێشهاتە لەدەڤەرێکی دیکە دەرکەوت و لەوێ چاوی بەدەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی کەوت. ئەوان پرسیاری ئەو بەسەرهاتەیان لێکرد. وتی: کەس ناتوانێت زیان لەمن بدات. ئەم وتەیە پێگەی ئەوی لای خەڵکان بەرزتر کرد. دواتر لەخۆی ترسا و رووی کردە شام و چیتر کەس گوێبیستی هەواڵەکانی نەبوو و دواتر ئەویان بەناوی پیاوێك ناو برد کە لەماڵەکەیدا بوو. بەکەرمیتەی مانگادار ناویان برد و دواتر ئەم ناوەیان کورت کردەوە و قەرمەت ناویان برد. دەستەیەك لەهاوەڵانی زەکرەویە بەم شێوەیان گێڕاوەتەوە.

دەستەیەك وتوویانە قەرەمت نازناوی پیاوێك لەدەوروبەری كوفە بوو كە بەمانگاكانی خۆی دانەوێڵەی ئەم دەڤەرەی بۆ ئەم لاو لا دەبرد و بەحەمدان ناویان دەبرد و دواتر ئایینی قەرەمتییەكان لەكوفە بلاّو بوویەوە. تائی ئەحمەد كوڕی محەممەد لەكارەكانی ئەوان ئاگادار بوویەوە و بۆ هەركام لەوان ساڵانە یەك دیناری دیاری كرد. دەستەیەك لەخەڵكانی كوفە هاتن و كاری قەرەمتییەكان و تائییان بۆ فەرمانڕەوا باس كرد و ئاگاداریان كردەوە ئەوان شوێنكەوتەی ئایینێك جیاواز لەئایینی ئیسلامن و باوەڕیان وایە دەبێت شمشێر بەرووی شوێنكەوتەكانی محەممەدی پێغەمبەر(د.خ) بكێشن مەگەر ئەو كەسانەی بەیعەتیان لەگەڵ بكەن بەلاّم فەرمانڕەوا گرنگی پێنەدان.

بەوجۆرەی لەئایینی قەرەمتییەكان دەگێڕنەوە ئەوان كتێبێكیان هێناوە كە ئەمەی تیا نووسراوە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان، فەرەج كوڕی عوسمان لەگوندێك بەناوی نەسرانە و بانگەشەكەری مەسیحییەتە كەدەڵێت:

مەسیح وشەی خواوەندە و مەسیح مەهدییە و مەسیح ئەحمەد كوڕی محەممەد كوڕی حەنیفەیە (منالّی عەلی كوڕی ئەبی تالیب كە بەبڕوای كیسانییەكان ئیمامی سێیەمی شیعەیە) و هەمان جبرەئیلە و دەڵێت مەسیح لەجەستەی مرۆڤێك دەركەوت و پێی وت: تۆ بانگەشەكەر و تۆ بەڵگە و تۆ یەحیا كوڕی زەكەریا و تۆ رۆحی پیرۆزیت و پێی بڵێن نوێژ چوار رەكعەتە، دوو رەكعەت پێش هەلاّتنی هەتاو و دوو رەكعەت دوای ئاوا بوونی هەتاو. بانگ لەهەر نوێژێك ئەمەیە كەدەڵێت: الله اكبر، الله اكبر، اشهد ان لا اله الا الله (دووجار) اشهد ان آدم رسول الله، اشهد ان موسی رسول الله، اشهد ان عیسی رسول الله، اشهد ان محمد رسول الله، اشهد ان احمد بن محمد بن حنیفه رسول الله. قیبله رووەو بیت المقدسه ( حەجیش بۆ بیت المقدس). هەینی رۆژی دووشەممەیە كە نابێت كاری تیا بكرێت و سوره ئەمەیە: الحمدلله بكلمته و تعالی باسمه المتخذ لاولیائة باولیائه، یسألونك عن الاهلة قل هی مواقیت للناس، لیعلم عدد السنین و الحساب و الشهور و الایام و باطنها اولیائی الذین عرفوا عبادی سبیلی اتقونی یا اولی الالباب و انا الذی لا اسال عما افعل و

انا العليم الحكيم و انا الذى ابلوا عباذى و امتحن خلقى، فمن صبر على بلائى و محنتى و اختبارى القيته فى جنتى و اخلدته فى نعمتى و من زال عن امرى و كذب رسلى اخذته مهانا فى عذابى و اتممت اجلى و اظهرت امرى علة السنة رسلى، و انا الذى لم يعل على جبار الا وضعته و لا عزيز الا اذللته و ليس الذى اصر على امره و دام على جهالته و قالوا لم نبرح عليه عاكفين و به موقنين، اولئك هم الكافرون. دواتر دەچێته ركوع و دەڵێت: سبحان ربى رب العظة و تعالى، عما يصف الظالمون، ئەمە دووجار دووبارە دەكاتەوە. دواتر دەچێتە سوجدە و دەڵێت: الله اعلى، الله اعلى، الله اعظم، الله اعظم.

لەم ئایینەدا تەنیا دوو رۆژ لەساڵ بەرۆژوو دەبن، ئەم دوو رۆژە مێهرەگان ونەورۆزە. شەرابی خورما ناڕەوایە و شەرابی ترێ، ڕەوا. نزیکی غوسڵی ناوێت مەگەر دەستنوێژێك هاوشێوەی دەستنوێژەكانی دیكە. هەركەس لەگەڵ ئەو بجەنگێت، خوێنی ڕەوایە و هەر ناسازگارێك دژی ئەو نەجەنگێت، دەبێت باج بدات. ئەو ئاژەڵانەی گاز دەكرن و چنگیان هەیە، نابێت بخورێن.

ڕۆشتنی قەرەمت بۆ دەوروبەری كوفە پێش كوژرانی ساحەبی زەنج بوو. قەرەمت ڕۆشتە لای ساحەبی زەنج و پێی وت: من شوێنكەوتەی ئایینێكم كەسەد هەزار شمشێر وەشێن هاورێیەتیم دەكەن. گفتوگۆم لەگەڵ بكە. ئەگەر باوەڕمان بەئایینەكەی تۆ هێنا، لەگەڵ هاوەڵانی خۆمان پەیوەستی تۆ دەبین و ئەگەر باوەڕمان نەهێنا، بەجێت دەهێڵین. ئەوان گفتوگۆیان كرد و باوەڕیان بەباوەڕی یەكتر نەهێنا. بەمشێوەیە قەرەمت بەجێی هێشت.

## جەنگی ڕۆمییەكان و مەرگی بازمار

لەجومادی الاخرە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە، ئەحمەدی عوجەیفی هاتە تەرسوس و لەگەڵ بازمار جەنگی هاوینەی ئەنجامدا و تا شكەند پێشڕەوی كرد. لەتە بەردێك لەكەشكەنجیر بەر كەلەكەی بازمار كەوت و ئەوەندەی نەمابوو دەست بەسەر شكەند بگرن كەبازمار مرد و لەنیوەی ڕەجەب/ بیست و چواری ئۆكتۆبەر مرد و گەڕێنرایەوە بۆ تەرسوس و لەوێ بەخاك سپێردرا.

ئەو پێش مەرگ گوێڕایەڵی خۆی بۆ فەرمانەکانی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون نیشاندا و کاتێك مرد، کوڕەکەی جێگەی گرتەوە و هەواڵی مەرگی باوکی بۆ خەمارەویە نووسی. خەمارەویە ئەوی کردە فەرمانڕەوای سنوری تەرسوس و بەئەسپ وکەرەستەی جەنگ هاوکاری کرد. دواتر ئەوی لابرد و کوڕە مامی خۆی محەممەد کوڕی موسا کوڕی تولونی وەك فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد.

## ئاژاوەی تەرسوس

لەم ساڵەدا خەڵکانی تەرسوس دژی فەرمانڕەواکەی خۆیان محەممەد کوڕی موسا ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە و گرتیان. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێك موەفەق مرد یەکێك لەخزمەتکارە تایبەتەکانی ئەو بەناوی راغیب جیهادی هەڵبژارد و ڕووی کردە تەرسوس تا لەوێ بمێنێتەوە. کاتێك گەیشتە شام، چوارپێکان، کەرەستە و خێوەتەکانی خۆی لەپێشەوە بۆ تەرسوس نارد و خۆی سوارە بەرێکەوت تا چاوی بەخەمارەویە بکەوێت و ئەو لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە. کاتێك لەدیمەشق چاوی پێی کەوت، خەمارەویە رێزی لێگرت و لێی نزیك بوویەوە و بەم شێوەیە راغیب شەرمی کرد داوای لێبکات ڕێگەی خۆی بۆ تەرسوس بگرێتەبەر و ماوەیەکی زۆر لای ئەو مایەوە. هاوەڵانی گومانیان کرد خەمارەویە ئەوی گرتووە و ئەم گومانەی خۆیان لەناو خەڵك بڵاو کردەوە. ئەمە لای خەڵکان دژوار و بەخۆیان وت: خەمارەویە کەسێکی گرتووە کەمەبەستی جیهاد لەرێگەی خواوەندی لەسەردا بووە. بەم شێوەیە دژی فەرمانڕەواکەی خۆیان محەممەد کوڕی مامی خەمارەویە شۆڕشیان کرد و ئەویان گرت و وتیان: تا ئەو کاتەی کوڕی مامەکەت، راغیب ئازاد نەکات، لەزیندان دەمێنیتەوە. ئەوان ماڵەکەیان تالان کرد و پەردەی بنەماڵەکەیان دڕی.

خەمارەویە ئاگادار بوویەوە و راغیبی لەو پێشهاتە ئاگادار کردەوە. مۆڵەتی پێدا بەرەو تەرسوس بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە تەرسوس، دانیشتوانی تەرسوس فەرمانڕەواکەی خۆیان ئازاد کرد. محەممەد دوای ڕزگاری پێی وتن: خواوەند

دراوسێیەتی ئێوە قێزەون بکات. لەوێوە رووی کردە بیت ئەلموقەدەس و لەوێ مایەوە. کاتێك تەرسوسی بەجێهێشت، عوجەیفی بۆ شارەکە گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا ئەستێرەیەك دەرکەوت هاوشێوەی پرچێکی کلکدار.

لەم ساڵەدا هارون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاقی هاشمی رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەبدولکەریمی دێر عاقولی مرد.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی کونداجیق مرد و دەوروبەری موسڵ و دیاری رەبیعە کە لەژێر فەرمانی ئەودا بوو، کەوتە ژێر فەرمانی محەممەدی کوڕی.

لەم ساڵەدا ئیدریس کوڕی سەلیمی فەقعەسی موسڵی مرد. ئەو حەدیسی زۆری گێڕاوەتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و حەفتا و نۆی کۆچی (٨٩٢ زایینی)

## لابردنی جەعفەر کوڕی موعتەمید لەجێگری خەلافەت و جێگری موعتەزید

لەموحەرەم/ ئاوریلی ئەم ساڵە، موعتەمید عەلی الله دانیشتنێکی ڕێکخست و تیایدا سەرکردەکان، فەرماندەکان و قازییەکان و گەورەکان کۆبوونەوە و ئەوانی ئاگادار کردەوە کەکوڕەکەی مفوض الی الله جەعفەر لەجێگری خەلافەت لابردووە و موعتەزید بالله کوڕی موەفەقی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردووە. هەموویانی کردە شایەت کەمفوەزی لەجێگری لابردووە و ناوی ئەو لەسەر دراوەکان، نامەکان و شتەکانی دیکە سڕایەوە. بەناوی موعتەزیدەوە وتار خوێنرایەوە و ئەو ڕۆژە، ڕۆژی گەورە بوو. یەحیا کوڕی عەلی ئەم پیرۆزباییەی بۆ موعتەزید نووسی:

| | |
|---|---|
| ليهنك عقد انت فيه المقدم | حباك به رب بفضلك اعلم |
| فان كنت قد اصبحت والى عهدنا | فانت غدا فينا الامام المعظم |
| و لا زال من و لاك فينا مبلغا | مناه و من عاداك يشجى و يرغم |
| و كان عمود الدين فيه تأوود | فعاد بهذا العهد و هو مقوم |
| و اصبح وجه الملك جذلان ضاحكا | يضى لنا منه الذى كان يظلم |
| فدونك فاشدد عقدما قد حويته | فانك دون الناس فيه المحكم |

واتاکەی: پیرۆزت بێت ئەو پەیمانەی بۆ تۆ بەسترا و تۆ تیایدا لەپێشتریت (لەکوڕەکەی خەلیفە) خواوەندی تۆ کەبۆ لەپێشی تۆ زاناترە، ئەوەی بەتۆ بەخشیوە. تۆ هەنووکە جێگری خەلیفەی ئێمەیت، سبەی دەبیتە پێشەوایەکی گەورە، کەسێك تۆی لەناو ئێمەدا بۆ ئەم پێگەیە بەرز کردەوە، تۆ بەئارەزووەکەت شادمان دەکات و دوژمنەکەت خەمبار و سەرشۆڕ. لەناو دینیدا ناراستی دەبینرا و بەم فەرمانڕەوایەتییە ڕاست بوویەوە و ڕوخساری فەرمانڕەوایەتی شادمان بوو. هەر شتێك پێش ئێستا تاریك بوو، ڕووناکی کردەوە. ئەوەی بەدەست هێناوە،

بەبەهێزی رایبگرە چوونکە تۆ تەنیا لەناو خەڵکان بەهێزیت.

لەم ساڵەدا جارچی لەبەغداد جارِیدا لەسەر رێگە یا لەمزگەوت قازی، ئەستێرەناس، فاڵگر دانەنیشن و کتێب فرۆشەکان سوێندیان خوارد چیتر کتێبەکانی زانستی کەلام و فەلسەفە نەفرۆشن.

لەم ساڵەدا جەراد، دەبیری باوکی سەقەر ئیسماعیل کوڕی بولبول دەستگیر کرا.

هەروەها لەم ساڵەدا باکوی تەڵحە، مەنسور کوڕی موسلیم لەشارەزوور گەڕایەوە و لەم کاتەدا قۆلبەستیان کرد.

## جەنگی نێوان خەواریج، موسڵییەکان و عەرەبەکان

لەم ساڵەدا خەوارج بەسەرکردایەتی هارون و هاورێیەتی دەستەیەك لەجیهاد کەران و خۆبەخشەکانی موسڵ و حەمدان کوڕی حەمدونی تەغلەبی بۆ جەنگ لەگەڵ مناڵەکانی شەیبان یەکیان گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو دەستەیەك لەمناڵەکانی شەیبان لەزاب گوزەریان کرد و مەبەستی نەینەوا، دەوروبەری موسڵیان کرد تا ئەو ناوچە و موسڵ تالأن بکەن. هارونی شاری و حەمدان کوڕی حەمدون و ژمارەیەك لەخۆبەخشەکانی موسڵ و گەورەکانی ئەم شارە بۆ جەنگ لەگەڵ ئەوان و دەرپەڕاندیان یەکیان گرت.

مناڵەکانی شەیبان لەبەعشیقە ئوردوویان لێدابوو. هارون کوڕی سلێمان موالی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخی شەیبانی، فەرمانڕەوای دیاربەکر، لەگەڵ ئەواندا بوو. هارون، لەلایەن محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیق وەك فەرمانڕەوای موسڵ ڕەوانە کرابوو بەڵام موسڵییەکان بەفەرمانڕەوایەتی ئەو رازی نەبوون و دەریانکرد. ئەو مەبەستی پەیوەست بوون بەمناڵەکانی شەیبانی کرد تا لەجەنگ لەگەڵ خەواریج و خەڵکانی موسڵ هاوکارییان بکات. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و ریزیان بەست و خوێنی یەکیان ڕشت. سەرئەنجام مناڵەکانی شەیبان شکستیان خوارد و حەمدان و خەواریج شوێنیان کەوتن و دەستیان بەسەر ماڵەکانیاندا گرت و تالأنیان کرد.

کاتێك مناڵەکانی شەیبان شکستیان خوارد، زانیان جگە لەخۆڕاگری، هیچ ڕێگەیەکی دەرباز بوون و هەڵاتنیان نییە. دووبارە گەڕانەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ. ئەمە لەکاتێکدا بوو خەڵکان بەتالانییەوە سەرقاڵ بوون. مناڵەکانی شەیبان دەوریان گرت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی موسڵ کوژران و سەرکەوتن بەعەرەبە دەشتەکییەکان بڕا.

هارون کوڕی سیما نامەی بۆ محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیق نووسی کەئەگەر فریا نەکەوێت شارەکەیان لەدەست دەچێت. محەممەد کوڕی ئیسحاق لەگەڵ سوپایەکی گەورە رووی کردە موسڵ. شارۆمەندانی موسڵ ترسان ودەستەیەکیان ڕێگەی بەغدادیان گرتەبەر و خوازیاری ڕەوانە کردنی فەرمانڕەوایەك بۆ خۆیان بوون بۆ ئەوەی کوڕی کونداجیق لەوان دوور بکاتەوە. ئەوان لەڕێگەی حەدیسە گەڕانەوە. ڕێداری ئەو ناوچەیە محەممەد کوڕی یەحیای مەجروج بوو. موعتەزید ئەم ئەرکەی پێ سپاردبوو و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی موسڵی بەدەست گەیشتبوو. ئەم دەستەیە هانیاندا تا لەڕۆشتن پەلە بکات و بۆ گەیشتن بەو سەرزەمینە پێش کوڕی کونداجیق بکەوێتەوە و لەوەی کوڕی کونداجیق پێش ئەو بگاتە ناو موسڵ، ئاگاداریان کردەوە و ترساندیان. محەممەدی مەجروح پێش ئەو گەیشتە موسڵ و محەممەد کوڕی کونداجیق گەیشتە بەلەد و ئاگاداریان کردەوە کەکوڕی مەجروح ڕۆشتۆتە ناو موسڵ.

کوڕی کونداجیق لەکەمتەرخەمی خۆی پەشیمان بوویەوە و نامەیەکی بۆ خەمارەویە کوڕی تولون نووسی و لەم پێشهاتە ئاگاداری کردەوە. ئەو، باوکی عەبدوللە کوڕی جەساسی بەدیاری گرانبایی بۆ بارەگای موعتەزید ڕەوانە کرد و چەندین داوای خستە بەردەم کەیەکیان گەڕاندنەوەی موسڵ بۆ بارودۆخی جاران بوو. موعتەزید بەم داوایە رازی نەبوو و پێی ۆت موسڵییەکان رازی نابن ئەو فەرمانڕەوایان بۆ دیاری بکات و گرنگی بەم وتەی خەمارەویە نەدا.

مەجروح ماوەیەك لەموسڵ مایەوە و موعتەزید ئەوی لەسەر کار لابرد و دوای ئەو عەلی کوڕی داود کوڕی رەهزادی کوردی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دەستنیشان کرد. شاعیری عوجەیەنی ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

ما رای الناس لهذا الــ دهزمد کانوا شبیها
ذلت الموصل حتی امر الاکراد فیها

واتاکەی: خەڵکانی لەو ڕۆژگارەی ژیانیان پێ براوە، هاوتای ئەم ڕۆژگارەیان نەبینیوە. موسڵ تا ئەو جێگەی ریسوا بووە کەکوردەکان فەرمانڕەوایەتییان گرتۆتە دەست.[١٧]

## مەرگی موعتەمید

لەشەوی نۆزدەی ڕەجەب/ حەوت ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە موعتەمید عەلی الله مرد. ئەو ڕۆژی شەممە لەکەنار ڕووباری دیجلە لەحەسەنی بەغداد بادەی خواردەوە و شەو بەرادەیەك نانی خوارد کەبەیانی نەبینی و مرد. موعتەزید قازی و گەورەکانی کۆکردەوە و هەمووان سەیری جەنازەکەی ئەویان کرد. ئەویان بردە سامەرا و بەخاکیان سپارد.ساڵەکانی ژیانی لەپەنجا ساڵ وشەش مانگ کۆتایی پێهات. شەش مانگ لەموەفەق گەورەتر بوو. بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ و شەش مانگ خەلافەتی کرد.

لەماوەی دەورانی خەلافەتی لەژێر فەرمانی موەفەقی برایدا بوو. موەفەق بەرادەیەك بارودۆخی لێ دژوار کردبوو کەرۆژێك پێویستی بەسێ دینار بوو بەلاّم دەستی نەکەوت و ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان:

الیس من العجائب ان مثلی یری ما قل ممتنعا علیه
و توخذ باسمه الدنیا جمیعا و ما من ذاك شی فی یدیه
الیه تحمل الاموال طرا و یمنع بعض ما یجبی الیه

واتاکەی: ئایا ئەمە لەسەرسورهێنەرەکان نییە کەکەسێکی وەك من سامانێکی کەم بەخۆیەوە نەبینێت و تەواوی جیهان بەناوی ئەو دەستی بەسەردا بگیرێت بەلاّم هیچی پێ نەبڕێت. هەموو سامانەکان بۆ ئەو دەنێردرێن و بەشێك لەوانەی

---

[١٧] - ئەمە دەمارگیری و نەزانی عەرەبە داگیرکەرەکان دیاری دەخات. بەئێستایشەوە بەشێکی هەرە زۆری دانیشتوانی موسڵ لەکوردەکان پێکدێن سەرەرای ئەو هەموو سیاسەتە فاشیستانەی عەرەبەکان بەدرێژایی مێژوو بۆ راگواستنی کوردەکان لەو دەڤەرە و نیشتەجێ کردنی عەرەبەکان. (وەرگێر)

وەرگیراوە، لەو درێغ دەکرێت.

ئەو یەکەم خەلیفە بوو لەسەرەتای ئاوەدانی سامەرا لەو شارە ڕۆشت و چیتر نەگەڕایەوە. (ڕۆشتە بەغداد ولەوێ مرد).

## خەلافەتی باوکی عەباس موعتەزید

لەبەرەبەیانی ئەو شەوەی موعتەمید مرد، بەیعەتیان لەگەڵ باوکی عەباس موعتەزید باللە ئەحمەد کوڕی موەفەق باوکی ئەحمەد تەڵحە کوڕی متوکیل بەست. ئەو بەدری بەندەی خۆی وەك سەرۆکی ئاسایش و عوبەیدالله کوڕی سلێمان وەك وەزیر و محەممەد کوڕی شا کوڕی مالکی وەك فەرماندەی پاسەوانەکان دەستنیشان کرد. لەشەوال/ دێسامبەر پەیکی عەمرۆ کوڕی لەیس چەندین دیاری گرانبایی هێنایە بارەگاکەی و داوای لێکرد خوراسان بەو بسپێرێت. موعتەزید ئالأی خوراسانی بۆ پێچایەوە و ئالأکەی لەگەڵ فەرمان و خەلأت بۆ عەمرۆ ڕەوانە کرد. عەمرۆ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئالأکەی لەسەر سەری خۆی هەڵکرد.

## مەرگی نەسری سامانی

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی مرد. ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد وەك جێگری نەسر لەماوەرا ئەلنەهر دەستنیشان کرا. نەسر دیندار و بیرمەند و شاعیر بوو. ئەم هۆنراوەی ئەو سەبارەت بەرافیع کوڕی هەرسیمەیە:

اخوك فيك على خبرو معرفة    ان الذليل ذليل حيثما كانا

لولا زمان خؤون فى تصرفه    و دولة ظلمت ما كنت انسانا

واتاکەی: براکەت لەگەڵ ئەزمون و ئاشنایی برا دڵسۆزی تۆ دەبێت و مرۆڤی ریسوا لەهەر شوێنێك بێت، ریسوایە. ئەگەر ڕۆژگاری خیانەت پیشە لەکردار و حکومەتی ستەم پیشە لەئارادا نەدەبوو نەدەبوویتە مرۆڤ (چوونکە لەبەرابەر ستەمکار مرۆڤانە هەڵس وکەوتت دەکرد و دادت بڵاو دەکردەوە.

## لابردنی رافیع کوڕی هەرسیمە لەخوراسان و کوشتنی ئەو

لەم ساڵەدا موعتەزید، رافیع کوڕی هەرسیمەی لەفەرمانڕەوایەتی خوراسان دوور خستەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوەیە بوو موعتەزید نامەیەکی بۆ رافیع نووسی تا گوندەکانی دەوروبەری رەی کەتایبەتە بەحکومەت، بۆ حکومەت بگەڕێنێتەوە بەلاّم رافیع رازی نەبوو. هاوەلاّنی پێشنیاریان پێکرد ئەم گوندانە بگەڕێنێتەوە تا بەهۆی نامەیێکەوە بارودۆخی پەرێشان نەبێت بەلاّم دووبارە رافیع رازی نەبوو. موعتەزید فەرمان نامەیەکی بۆ ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆڵف نووسی و فەرمانی پێدا بۆ جەنگی رافیع بڕوات و ئەو لەڕەی دوور بخاتەوە. موعتەزید نامەیەکی بۆ عەمرۆ کوڕی لەیس نووسی و ئەوی وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاری کرد.

ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز رووبەرووی رافیع بوویەوە و جەنگ دەستی پێکرد و سەرئەنجام رافیع لەڕەی ڕۆشت و رووی کردە جورجان. ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز لەساڵی ٢٨٠/٨٩٣ زایینی مرد و رافیع دووبارە هاتە ڕەی. عەمرۆ و بەکر دوو کوڕەکەی عەبدولعەزیز رووبەرووی بوونەوە و شەڕێکی قورس لەنێوان هەردوو سوپا روویدا و عەمرۆ و بەکر شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکانیان کوژران. ئەوان لەجومادی الاوەلی ٢٨٠/ جولای ٨٩٣ زایینی خۆیان گەیاندە ئیسفەهان.

رافیع پاشماوەی ئەم ساڵەی لەڕەی بەسەر برد. لەم کاتەدا عەلی کوڕی لەیس کە لەڕەی هاوڕێی رافیع بوو، مرد. دواتر عەمرۆ کوڕی لەیس لەجومادی الاوەلی ٢٨٠/ جولای ٨٩٣ زایینی هاتە نەیشابور و دەستی بەسەر ئەو شارە و خوراساندا گرت. ئەم هەواڵە بەرافیع گەیشت. هاوەلاّنی خۆی کۆکردەوە، راوێژی لەگەڵ کردن و وتی: دوژمنان گەمارۆیانداوین و من لەیەکگرتنی ئەوان دژی خۆمان ئاسوودە نیم. محەممەد کوڕی زەید لەدەیلەم و چاوەڕوانی دەفەرتێکی گونجاوە، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بەهۆی ئەو بەلاّی بەسەرم هێنا، چاوەڕوانە تۆڵەم لێ

بستێنێتەوە و ئێستایش عەمرۆ کوڕی لەیس و هەموو سوپاکەی روویان کردۆتە خوراسان. بەباشی دەزانم لەگەڵ محەممەد کوڕی زەید پەیمانی ئاشتی ببەستم و تەبەرستان بۆ ئەو بگەڕێنمەوە و ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عەبدولعەزیز بگرمەبەر دواتر هێرش بکەمە سەر عەمرۆ کوڕی لەیس و لەخوراسانی دەرپەڕێنم. هاوەڵانی ئەو ڕەزامەندی خۆیان نیشاندا و رازی بوون. پەیکی بۆ لای عەمرۆ کوڕی عەبدولعەزیز نارد و خوازیاری پەیمانی ئاشتی بوو. ئەو دوانە لەشەعبانی ٢٨٠/ئۆکتۆبەری ٨٩٣ زایینی ئاشتییان کرد.

دواتر رافیع رووی کردە تەبەرستان و لەشەعبانی ٢٨١/ ئۆکتۆبەری ٨٩٤ زایینی ڕۆشتە ئەو شارە. ئەو پێشتر لەجورجان مابوویەوە و کاروبارەکانی هەڵدەسوڕاند. کاتێك لەتەبەرستان جێگیر بوو، نامەی بۆ محەممەد کوڕی زەید نووسی و ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر. محەممەد کوڕی زەید بەڵێنی پێدا بەناردنی چوار هەزار جەنگاوەری دەیلەمی بۆ ڕەی هاوکاری بکات. رافیع لەرەبیع الاخری ٢٨٢/ مەی ٨٩٥ زایینی لەتەبەرستان و جورجان بەناوی محەممەد وتاری خوێندەوە.

هەواڵی ئاشتی نێوان محەممەد کوڕی زەید و رافیع بەعەمرۆ کوڕی لەیس گەیشت. عەمرۆ کوڕی لەیس پەیکی بۆ لای محەممەد کوڕی زەید نارد وئەوی لەکردەوەکانی رافیع ئاگادار کردەوە و پێی وت ئەگەر رافیع بەهێز ببێت، فێڵی لێ دەکات. محەممەد کوڕی زەید لەهاوکاری کردنی ئەو بەسوپا پەشیمان بوویەوە.

کاتێك پێگەی عەمرۆ کوڕی لەیس بەرز بوویەوە، سپاسی محەممەد کوڕی زەیدی بۆ هاوکاری نەکردنی رافیع کرد و تەبەرستانی پێ سپارد. کاتێك رافیع لەهاوکاری محەممەد کوڕی زەید دڵنیابوو، ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و لەرەبیع الاخری ٢٨٣/ مەی ٨٩٦ زایینی هاتە نەیشابور و لەنێوان ئەو و عەمرۆ جەنگێکیماڵوێرانکەر روویدا و سەرئەنجام رافیع شکستی خوارد وبۆ ئەبیوەرد هەڵات و عەمرۆ، موعەدەل و لەیس دوو کوڕی براکەی عەلی کوڕی لەیسی لەرافیع وەرگرتەوە. ئەم دوانە دوای مەرگی براکەی عەلی لای رافیع مابوونەوە.

کاتێك رافیع هاتە ئەبیوەرد مەبەستی هەرات یا مەروی کرد. بەڵام عەمرۆ ئەمەی

زانی و ڕێگەی ئەوی لەسەرەخس بەست. کاتێك ڕافیع زانی عەمرۆ لەنەیشابور هاتۆتەدەر، لەرێگە دژوارەکان بەرەو نەیشابور بەرێکەوت کەهیچ سوپایەك لەوێوە گوزەری نەدەکرد. عەمرۆ لەسەرەخس گەڕایەوە و لەنەیشابور گەماڕۆی خستە سەر ڕافیع. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و دەستەیەك لەسەرکردەکانی ڕافیع داوای ئەمانیان لەعەمرۆ کرد و سەرئەنجام ڕافیع و سوپاکەی شکستیان خوارد. ڕافیع، محەممەد کوڕی هەرسیمەی برای بۆ لای محەممەد کوڕی زەید نارد و داوای هاوکاری لێکرد و داوای ئەو جەنگاوەرانەی لێکرد کەبەڵێنی پێدابوو بەڵام محەممەد کوڕی زەید سوپای نەنارد. هاوەڵان و بەندەکانی ڕافیع لەدەوری ئەو بڵاوەیان لێکرد. ئەو خاوەنی چوار هەزار بەندە بوو. هیچ کام لەکارگوزارانی خوراسان، پێشتر هێزی وەك ئەویان نەبوو. محەممەد کوڕی هارون لەو جیابوویەوە و پەیوەستی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی لەبوخارا بوو. ڕافیع سوار وشتر بۆ خوارەزم هەڵات و سامان وکەرەستەکانی خۆی لەگەڵ دەستەیەك برد. ئەم پێشهاتە لەرەمەزانی ٢٨٣/٨٩٦ زایینی ڕوویدا.

کاتێك ڕافیع گەیشتە ڕەباتی جەبوە، خوارەزمشا، باوکی سەعیدی دەرغانی بۆ پێشوازی ئەو نارد تا میوانداری بکات و بیباتە خوارەزم. باوکی سەعید دارایی و سوارەکانی ئەوی بەکەم بینی، لەبەر ئەمە ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و لەحەوتی شەوالی ٢٨٣/ هەژدەی نۆڤەمبەری ٨٩٦ زایینی کوشتی و سەری ئەوی بۆ عەمرۆ کوڕی لەیس نارد. عەمرۆ سەری ڕافیعی بۆ دەرگای موعتەزید نارد. سەری ڕافیع لەساڵی ٢٨٤/٨٩٧ زایینی بەدەستی موعتەزید گەیشت و ئەو سەری ڕافیعی بەرز کردەوە و سنووری خوراسان تا کەنارەکانی جەیحون کەوتە ژێر فەرمانڕەوایەتی عەمرۆ.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا حسیەن کوڕی عەبدوللە ناسراو بەکوڕی جەساس لەگەڵ دیارییە فراوانەکان لەمیسرەوە هاتە بارەگای موعتەزید و موعتەزید لەگەڵ کچی خەمارەویە پەیوەندی هاوسەرگیری بەست (دیارییەکان هەم جیازی کچی خەمارەویە بوو کە لەو سەردەمەدا وێنەی نەبوو)

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخ دەستی بەسەر قەڵای ماردیندا گرت. ئەم قەڵایە پێشتر لەدەستی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیقدا بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا هارون کوڕی محەممەد ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەمە دوایین حەجی ئەو لەگەڵ خەڵکان بوو. یەکەم حەجی لەگەڵ خەڵکان لەساڵی ٨٧٧/٢٦٤ زایینی بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی عیسا محەممەد کوڕی عیسا کوڕی سورەی تەرموزی سولەمی لەمانگی ڕەجەب/ سێپتامبەر لەتەرموز، مرد. ئەو پێشەوایەك بوو کەقورئانی لەبەر و خاوەنی چەندین کتێبە کە الجامع الكبير لەحەدیس لەباشترینی ئەوان هەژمار دەکرێت. ئەو کوێر بوو. ئیبراهیم کوڕی محەممەدی مودەبیر لەشەوال/ دێسامبەری ئەم ساڵە مرد. ئەو سەرۆکی دیوانی ئەملاك (مڵك و ماڵ) بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتای کۆچی (٨٩٣ زایینی)

## زیندانی کردنی عەبدوڵله کوڕی موهتەدی

لەم ساڵەدا موعتەزید، عەبدوڵله کوڕی موهتەدی و محەممەد کوڕی حسەین ناسراو بەشومەیلەی گرت و زیندانی کردن. شومەیله تا دوایین ڕۆژەکان لەگەڵ ساحەبی زەنج مایەوە. دواتر داوای ئەمانی لەموەفەق کرد و پێی بەخشرا.

هۆکاری ئەم کارەی موعتەزید ئەوە بوو یەکێك لەئەمان بەخشراوەکان (لەهاوەڵان و سوپاییەکانی ساحەبی زەنج) موعتەزیدی ئاگادار کردەوە شومەیله بانگەوازی خەلافەت بۆ پیاوێك دەکات کەناوی نازانێت و دەستەیەك لەسوپاییەکان و خەڵکانی گومڕا کردووە. موعتەزید ئەوی گرت و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد بەڵام ئەو هیچ شتێکی نەگرتەخۆ و وتی: ئەگەر ئەم پیاوە لەژێر قاچی مندا دەبوو، قاچم هەڵنەدەگرت (ئاشکرام نەدەکرد). موعتەزید فەرمانیدا بەیەکێك لەکۆڵەکەکانی خێوەتێك بیبەستنەوە. دواتر ئاگری پێکرد و ئەوەندە بەدەوری ئاگرەکەدا سوڕاندی کەپێستی کەوتەخوار. دواتر سەری بڕی و لەنزیك پردەکە جەستەی هەڵواسی. بەدوای ئەو عەبدوڵله کوڕی موهتەدی زیندانی کرد و تا ئەو کاتەی بێ گوناحی ئەوی بۆ سەلما، لەزیندان مایەوە.

موعتەزید بەشومەیلەی وتبوو: ئاگادار بوومەتەوە تۆ خەڵکان بۆ خەلافەتی موهتەدی هان دەدەیت؟ شومەیله لەوەڵامدا وتبووی: ئەوەی سەبارەت بەمن کەوتۆتە سەرزاران ئەوەیە شوێنکەوتەی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبم.

## هێرشی موعتەزید بۆ سەر منالەکانی شەیبان و ئاشتی لەگەڵ ئەوان

لەسەرەتای سەفەر/ بیست و دووی ئاوریلی ئەم ساڵە موعتەزید لەبەغدادەوە مەبەستی منالەکانی شەیبانی کرد کە لەشوێنێك لەجەزیرە کۆبببوونەوە. کاتێك ئەوان لەهێرشەکەی موعتەزید ئاگادار بوونەوە، سامانەکانی خۆیان لەیەك شوێندا کەڵەکە کرد. موعتەزید هێرشی کردە سەر عەرەبەکانی دەوروبەری سن و

سامانەکانی تالآن و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت و بەئەندازەی کوژراوەکان لەناو ئاودا خنکان. هاوەلآنی بەرادەیەك تالآنییان دەستکەوت کە لەهەڵگرتن و گواستنەوەی ناتەوان بوون. لەبەر ئەمە هەر سەر مەڕێکیان بەیەك درهەم و یەك وشتریان بەپێنج درهەم دەفرۆشت.

موعتەزید رووی کردە موسڵ و بەلەد. منداڵەکانی شەیبان ڕۆشتنە لای و داوای بەخشینیان لێکرد و بارمتەیان لادانا. موعتەزید بەداواکەیان رازی و بۆ بەغداد گەڕایەوە.

دواتر پەیکی بۆ لای ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخ نارد و داوای ئەو سامانەی کرد کە لەکوڕی کونداجیقی سەندبوو. ئەحمەد کوڕی عیسا سامانی کوڕی کونداجیقی لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی ڕەوانە کرد.

## یاخیبوونی محەممەد کوڕی عوبادەی خارجی دژی هارونی خارجی

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عوبادە ناسراو بەباوکی جەوزە دژی هارون شۆڕشی کرد. باوکی جەوزە لەمناڵەکی زوهەیر و لەخەڵکانی قەبراسای یەقعا بوو. ئەم دووانە هەردووکیان شوێنکەوتەی خەواریج بوون. باوکی جەوزە سەرەتا هەژار و لەگەڵ دوو کوڕەکەی قارچکیان کۆدەکردەوە و دەیانفرۆشت و یا سەرقاڵی کاری لەم شێوەیە بوون تا ئەوەی دەستەیەکی کۆکردەوە و دروشمی خەواریجی هێنایە سەرزمان (لا حکم الا الله). خەڵکانی ئەو دەڤەرە لەدەوری کۆبوونەوە و پێگەی بەرز بوویەوە و دە یەکی دانەوێڵە و زەکاتی وەردەگرت. دواتر رووی کردە مەعلەسایا و لەبەرابەر وەرگرتنی پێنسەد دینار پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. باجی ئەو دیارەی کۆکردەوە و گەڕایەوە و لەکەناری سنجار قەلآیەکی دروست کرد و کالآ و خواردەمەنییەکانی خۆی بۆ ئەو شوێنە برد. کوڕەکەی، باوکی هیلالی لەگەڵ سەد و پەنجا کەس لەگەورەکانی منداڵەکانی زوهەیر و کەسانی دیکە لەو شوێنە دانا.

هارونی شاری ئەمەی بیست. ئەو و گەورەکانی هاورێی بڕیاریاندا سەرەتا مەبەستی لەناو بردنی قەلآکەی بکەن و کاتێك وێرانیان کرد، هێرش بکەنە سەر محەممەد کوڕی عوبادە. هارون سوپاکەی کۆکردەوە و ژمارەیان سەد پیادە و

هەزار و دووسەد سوار بوو. هارون بۆ گرتنی قەڵاکە خێرایی لەخۆی نیشاندا و ناکاوگیری کرد. محەممەد کوڕی عوبادە لەقەبراسا بوو بێ ئەوەی ئاگای لەم رووداوە بێت.

هارون بۆ گرتنی قەڵاکە هەوڵی زۆریدا. ئەو کەمەند و پەیژەی لەگەڵ خۆی بردبوو. هێرشی کردە سەر قەڵاکە. هاوەڵانی هارون رێگەیان نەدەدا کەس لەدیواری قەڵاکەوە سەر بەرز بکاتەوە. منداڵەکانی تەغلەب کە لەناو سوپاکەی هاروندا بوون کاتێك لەسەرکەوتنی ئەو دڵنیا بوون، بێ وەرگرتنی مۆڵەت ئەمانیان بەکەسانی ناو قەڵاکەدا. ئەم کارە لای هارون دژوار بوو بەڵام نەیتوانی رێز لەقەڵاکەی ئەوان نەگرێت. پێش ئەمانەکە تەنیا توانی باوکی هیلال کوڕی محەممەد کوڕی عوبادە و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەو بکوژێت. ئەوان قەڵاکەیان گرت و ئەوەی لەناو قەڵاکەدا بوو، تالان کرا.

دواتر بۆ جەنگی محەممەد لەقەبراسا بەرێکەوتن. محەممەد کوڕی عوبادە چوار هەزار جەنگاوەری لەگەڵدا بوو. جەنگ روویدا و هارون و سوپاکەی شکستیان خوارد. هارون هەڵات و دوای هەڵاتن لەشوێنێك وەستا و هاوەڵانی خۆی بەناو و نیشان بانگ کرد. نزیکەی چل کەس کۆبوونەوە و هێرشیان کردە سەر باڵی راستی محەممەد و شکستیان بەباڵی راست هێنا. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و محەممەد و سوپاکەی جەنگەکەیان دۆڕاند. سوپاکەی هارون شمشێریان خستە ناویان و هەزار و چوارسەد پیاویان لەوان کوشت. شەو جیایی لەنێوان دوو سوپاکە دروست کرد و هارون تالانییەکانی لەناو هاوەڵانی دابەش کرد. محەممەد بۆ ئامەد هەڵاتز فەرمانڕەوای ئامەد، ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخ دوای جەنگ ئەوی گرت و ڕەوانەی بارەگای موعتەزیدی کرد. موعتەزید هاوشێوەی مەڕ، پێستی داماڵی.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

کاتێك محەممەد کوڕی باوکی ساج دوای جەنگێکی سەخت و کوشندە و گەمارۆدانێکی بەربلاو، دەستی بەسەر مەراغەدا گرت، عەبدوللە کوڕی حەسەن و هاوەڵانی ئەوی دوای بەخشینی ئەمان، ئەسیر و زیندانی کردن. ئەو داوای لێکۆڵینەوە سامانەکانی ئاشکرا کرد بەڵام دوای ئەوەی سامانەکەی لێ سەند، خوێنی ڕشت.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆڵف مرد و دوای ئەو براکەی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز جێگەی گرتەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سور دەستی بەسەر عەماندا گرت و ژمارەیەك لەدانیشتوانەکەی سەر بڕی و ڕەوانەی بەغدادی کرد.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی موعتەمید لەمانگی رەبیع الاخر/ ژوئەن مرد. ئەو هاونشینی موعتەزید بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی جومادی الاوەل/ جولای، عەمرۆ کوڕی لەیس هاتە نەیشابور.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی باوکی ساج، سی کەس لەخەوارجی لەرێگەی موسڵەوە بۆ بەغداد نارد و زۆربەیان سەریان بڕا و ئەوانیتر زیندانی کران.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی ئەبا بۆ جەنگ ڕووی کردە تەرسوس. خەمارەویە کوڕی ئەحمەد ئەوی ناردبوو. دوای ئەو بەدری حەمامی هات و هەموان بەمەبەستی جەنگ لەگەڵ عوجەیفی، فەرمانڕەوای تەرسوس، بەرێکەوتن و گەیشتنە بەلقەسون.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی مەبەستی غەزا و جیهادی کرد و ڕووی کردە سەرزەمینی تورکەکان و دەستی بەسەر پایتەختی پاشای تورکەکان گرت و باوکی و خانمی ئەو، خاتونی ئەسیر کرد. دە هەزار کەسیان گرت و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بەرادەیەك چوارپێیان دەستکەوت کەهەژمار

ناکرێت. هەر سوارەیەك هەزار درهەم تالأنی دەستکەوت.

هەروەها لەم ساڵەدا راشید موالی موەفەق لەدینەوەر مرد و لەرەمەزان/ نۆڤەمبەر جەستەی بێ گیانی ئەویان بردە بەغداد.

لەشەوال/ دێسامبەری ئەم ساڵە مەسروری بەڵخی مرد.

لەم ساڵەدا لەڕەی و تەبەرستان وشکەساڵی روویدا، بەشێوەیەك بەهای سێ سەتڵ ئاو بەیەك درهەم دەفرۆشرا و نرخی خواردەمەنی بەرز بوویەوە.

لەشەوال، دێسامبەری ئەم ساڵە خۆر گیرا و دوبەیل تاریکی دایگرت و ئەم تاریکییە بەردەوام بوو. دوای نیو رۆژ بایەکی ڕەش هەڵیکرد و تا سێ یەکی شەو بەردەوام بوو. دوای ئەم ماوەیە لەشەو، ئەردهەژێنێك شارەکەی وێران کرد و تەنیا سەد ماڵ بێ زیان مایەوە. بەدوای ئەو ئەرد هەژێنە، پێنج ئەردهەژێنی دیکە روویدا و ژمارەی ئەو کەسانەی لەژێر داروپردوودا هێنرانەدەر، سەد و پەنجا هەزار کەس بوون. (هەموویان مردبوون)

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر کوڕی محەممەد کوڕی هارون کوڕی ئیسحاق ناسراو بە کوڕی تورونجە، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی یوسف باوکی ئیسماعیلی تەرموزی لەمانگی ڕەمەزان/ نۆڤەمبەر مرد. ئەو خاوەنی چەندین نوسراوە.

ئەحمەد کوڕی سەیار کوڕی ئەیوبی فەقیهی مەروزی کەزانا و خۆپارێز بوو لەگەڵ باوکی جەعفەر ئەحمەد کوڕی باوکی عیمران فەقیهی حەنەفی لەمیسر هەردووکیان ئەم دنیایان بەجێهێشت.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و یەکی کۆچی ( ٨٩٤ زایینی )

### ڕۆشتنی موعتەزید بۆ ماردین و زاڵبوون بەسەر ئەو شارە

لەم ساڵەدا موعتەزید بۆ دووەم جار مەبەستی موسڵی کرد تا لەگەڵ حەمدان کوڕی حەمدون جەنگ تاقی بکاتەوە چوونکە ئاگادار ببوویەوە ئەو خوازیاری پەیوەست بوون بەهارونی شارییە و بانگەشە بۆ ئەو دەکات. کاتێك عەرەبەکان و کوردەکان لەهێرشەکەی موعتەزید ئاگادار بوونەوە، سوێندی خوێنیان خوارد و بۆ جەنگ لەگەڵ موعتەزید یەکیان گرت و سوپاکەی خۆیان ڕازاندەوە. موعتەزید بێ هیچ کەرەستەیەك هێرشی کردە سەریان و ڕوبەڕوویان بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و ژمارەیەکی زۆر لەوان لەناو ڕووباری زاب خنکان.

دواتر موعتەزید ڕووی کردە موسڵ و مەبەستی قەڵای ماردینی کرد. ئەم قەڵایە تایبەت بوو بەحەمدان کوڕی حەمدون. حەمدان هەڵات وکوڕەکەی وەك جێگری خۆی دانا. موعتەزید گەیشتە قەڵاکە و ئەو ڕۆژەی بەجەنگ لەگەڵ دانیشتوانی قەڵاکە بەسەر برد. بەیانی ئەو ڕۆژە موعتەزید جەنگی دەست پێکردەوە و بانگی بەرز کردەوە: ئەی زادەی حەمدان. کوڕی حەمدان وەڵامی دایەوە. موعتەزید پێی وت: دەرگاکان بکەرەوە. کوڕی حەمدان دەرگاکانی کردەوە. موعتەزید لای دەروازەکە دانیشت و فەرمانیدا ئەوەی لەناو قەڵاکەدایە بیهێننەدەر و دواتر وێرانی کرد. دواتر کەسیان بەدوای حەمدان کوڕی حەمدون نارد و شوێنپێی هەڵگرت و دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت. موعتەزید دوای گەڕانەوە بۆ بەغداد ئەوی گرت.

موعتەزید لەکاتی گەڕانەوە مەبەستی حەسەنییەی کرد کەکوردێك بەناوی شەداد دەهەزار جەنگاوەری لەو قەڵایەدا ڕاگرتبوو. موعتەزید بەسەریدا زاڵ بوو و قەڵاکەی وێران کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا تورك مناڵی عەباس، کارگوزاری موعتەزید لەدیاری موزێر، لەجەزیرەوە هاتە بەغداد و چل و چەند کەس لەهاوەڵانی کوڕی ئەغەری لەگەڵ خۆی هێنا کە بەسەر سەمیسات زاڵبوو. ئەوبۆ ریسوا کردنی ئەم ئەسیرانە ئەوانی سواری وشتر کرد و کڵاوی بەرزی لەسەر و جل و بەرگی هەوریشمی لەبەر کردبوون. ئەوانی بردە زیندان و دواتر بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان وەسیف، خزمەتکاری کوڕی باوکی ساج و عومەر کوڕی عەبدولعەزیز جەنگ ڕوویدا و عومەر شکستی پێهێنا. دواتر وەسیف بۆ ری سەروەری خۆی محەممەد کوڕی باوکی ساج ڕۆشت.

هەروەها لەم ساڵەدا توغج کوڕی جوف بەفەرمانی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون بۆ جەنگی هاوینە ڕووی کردە تەرسوس و گەیشتە تەرابزون و لەجومادی الاخرە/ ئۆگۆست دەستی بەسەر بەلودیەدا گرت.

لەجومادی[18] ئەم ساڵە ئەحمەد کوڕی محەممەدی تائی مرد.

لەم ساڵەدا ئاو لەڕەی و تەبەرستان کەمی کرد.

لەم ساڵەدا موعتەزید ڕووی کردە کێوەکان و مەبەستی دەینەوەری کرد و کوڕەکەی عەلی یا هەمان موکتەفی وەك فەرمانڕەوای ڕەی، قەزوێن، زەنجان، ئەبهەر، قوم، هەمەدان و دەینەوەر، دەستنیشان کرد و ئەحمەد کوڕی ئەسبەغی وەك سەرۆکی دیوان هەڵبژارد و ئیسفهان، نەهاوەند، کەرەجی بەعومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆلف سپارد و لەبەر گرانی بەغداد بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەلی کورە، کارگوزاری رافیع لەڕەی، لەگەڵ نزیکەی هەزار کەس داوای ئەمانی لەموعتەزید کرد و تەسلیم بوو. ئەو بانگەوازی بۆ باوکی خۆی دەکرد.

---

[18] – دیاری نییە مەبەستی نووسەر جومادی الاوەلە یا جومادی الاخر. (وەرگێڕ)

لەزیقەعدە/ ژانویەی ئەم ساڵە، عەرەبەکان هاتنە سامەرا و کوڕی سیمایان کوشت.

هەروەها لەم ساڵەدا موسوڵمانان لەگەڵ ڕۆمییەکان جەنگیان ئەزمون کرد. ئەم جەنگە دوانزە ڕۆژ درێژەی کێشا و لەکۆتایی موسوڵمانەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو تالآنی زۆریان دەست کەوت و گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی محەممەد کوڕی عوبەید کوڕی باوکی دنیا، نوسەری چەندین کتێب، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و دووی کۆچی ( ٨٩٥ زایینی )

### نەورۆزی موعتەزیدی

لەم ساڵەدا موعتەزید فەرمانیدا بۆ هەموو کەنارەکان و شارەکان نامە بنووسن تا وەرگرتنی باج لەنەورۆزی ئێرانییەکانەوە دەست پێنەکەن و تا ڕۆژی یانزەی حوزەیران/ ژوئەن دوای بخەن. ئەو ئەم ڕۆژەی بەنەورۆزی موعتەزیدی ناو برد. نامەکان لەمبارەوە لەموسڵەوە نووسرا چوونکە موعتەزید لەوێ بوو.مەبەستی موعتەزید لەم کارە ئاسایشی خەڵکان و خۆشەویستی بۆ ئەوان بوو.

### هێرش بۆ سەرکوت کردنی حەمدان و تێکشاندنی ئەو و ملکەچ بوونی

لەم ساڵەدا موعتەزید کە لەموسڵ بوو، نامەیەکی بۆ ئیسحاق کوڕی یەعقوب و حەمدان کوڕی حەمدون نووسی و داوای لێکردن پەیوەستی ببن. ئیسحاق بۆ پەیوەست بوون بەموعتەزید بەڕێکەوت بەڵام حەمدان لەسنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی لەناو قەڵاکەی سەنگەری گرت و سامان و کۆیلەکانی خۆی شاردەوە. موعتەزید سوپاکەی خۆی بەفەرماندەیی وەسیفی مشك گر و نەسری قەشوری و سەرکردەکانی دیکە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەگەڵ حەسەم کوڕی عەلی کورە و هاوەڵانی ڕووبەڕوو بوونەوە کە لەشوێنێك بەناوی دێری زەعفەران لەسەرزەمینی موسڵ سەنگەری گرتبوو.

لەم کاتەدا حسەین کوڕی حەمدان کوڕی حەمدان گەیشت و کاتێك پێشەنگەکانی سوپای موعتەزیدی بینی، داوای ئەمانی کرد. ئەمانیان پێ بەخشی و ڕەوانەی بارەگای موعتەزیدیان کرد. موعتەزید فەرمانیدا ئەو قەڵایە وێران بکەن. وەسیف بەدوای حەمدان بەڕێکەوت. حەمدان لەباسورین بوو. وەسیف ڕووبەڕووی بوویەوە و ژمارەیەك لەهاوەڵانی کوشت. حەمدان سوار لەسەر بەلەمێك لەدیجلە پەڕییەوە و سامانەکانی لەگەڵ خۆی برد و ڕووی کردە ڕۆژئاوای دیجلە و خۆی گەیاندە دیاری ڕەبیعە.

ژمارەیەك لەسەربازەكان شوێنی كەوتن و شوێنپێیان هەڵگرت و خۆیان گەیاندە ئەو ماڵەی لەوێ دابەزیبوو. حەمدان كاتێ: ئەوانی بینی، سامانەكەی بەجێهێشت و هەڵات. سەربازەكان سامانەكەیان هەڵگرت و بردیانە لای موعتەزید. دەستەیەك بۆ گرتنی حەمدان شوێنی كەوتن. بارودۆخ بۆ حەمدان دژوار بوو و مەبەستی خێوەتەكانی ئیسحاق كوڕی ئەیوبی كرد. ئیسحاق هاوڕێی موعتەزید بوو. حەمدان داوای پەنای لێكرد و ئیسحاق ئەوی بردە بارەگای موعتەزید. موعتەزید فەرمانیدا گیانی بپارێزن. دواتر سەركردە كوردەكان بەردەوام داوای ئەمانیان دەكرد. ئەمە لەمانگی موحەرەم/ مارس روویدا.

## شكستی هارونی خارجی لەسوپای موسڵ

موعتەزید، نەسری قەشوری وەك فەرمانڕەوای موسڵ دەستنیشان كرد تا باجەكەی وەربگرێت و فەرمانی پێدا كارگوزارەكان بۆ ئەم كارە هاوكاری بكەن. فەرمانڕەوای مەعلەسایا لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی نەسر شۆڕشیان كردبوو. لەناكاو دەستەیەك لەخەواریج رووبەروویان بوونەوە و تا شەو شەڕە شمشێر بەردەوام بوو. تاریكی شەو جیایی لەناو ئەواندا دروست كرد. لەناو خەواریج پیاوێك بەناوی جەعفەر كوژرا كە لەهاوەڵە نزیكەكانی هارون بوو. كوژرانی ئەو بۆ هارون گران بوو. فەرمانی بەهاوەڵانیدا خراپەكاری لەشارەكاندا بكەن.

نەسری قەشوری نامەیەكی بۆ هارون نووسی و ئەوی ترساند كەخەلیفە لێی نزیكە و ئەگەر بخوازێت، خۆی و هەموو هاوەڵانی دەكوژێت. نەسر نووسی خەلیفە دەستی لەجەنگ دژی ئەو هەڵنەگرتووە بەڵكو رێگەی فرت و فێڵی گرتۆتەبەر. هارون لەوەڵامدا بۆی نووسی: نوسیبووت خەلیفە مەبەستی منی نییە و بۆ فێڵ پشتی كردۆتە جەنگی من، دەبێت بڵێم كاتێ خەلیفە و سوپاییەكانی چوست و چالاكی ئێمەیان بینی، بەخواستی خوا هاوشێوەی پەپولەكان بڵاوەیان لێكرد و وەك قامیشی ناو بەتاڵ پشتیان كردە جەنگ. هەركەس لەوان لەبەرابەر ئێمە خۆڕاگری بكات، تەنیا دەتوانێت پەنا بۆ دەرگا و دیوار ببات و بەهەرحاڵ ئێمە تەنیا یەك فەرسەنگ لەوانەوە دوورین و تۆ بەكوشتنی یەك لەهاوەڵانی

ئێمە(جەعفەر) فریو مەخۆ و گومان مەکە خوێنی ئەو لەبەرچاو ناگیرێت یا تۆڵەی خوێنی ئەو ناکەینەوە. هەرگیز بەو شێوە نییە و خواوەند، تۆ سەرکوت دەکات ویەخەت دەگرێت و بۆ گرتنی ماف ئێمە لەئێوە، هاوکاریمان دەکات. بۆ دەبێت ئێمە بۆ یەکی دیکە سەرکۆنە بکەیت و لەجیاتی بەخشین، دوژمنایەتی خۆت ئاشکرا بکەیت؟ ئەم هۆنراوەیە سەبارەت بەمن و تۆ راستە:

فلا توعدونا باللقاء و ابرزوا الینا سوادا نلقه بسواد

واتاکەی: ئێمە بەجەنگ مەترسێنن و لەگەڵ سوپایەکی گەورە رووبکەنە گۆڕەپان تا ئێمەیش بەسوپایەکی گەورە بۆ رووبەروو بوونەوە بێین.

سوێند بەخوا ئەگەر پێشنیار دەکەین بێنە گۆڕەپان نە لەبەر ئەوەیە کەباوەڕمان بەخۆمان هەیە و نە لەبەر ئەوەی لەهێزی خۆمان دڵنیایین بەڵکو تەنیا لەبەر باوەڕدار بوون بەخواوەند و پشت گەرمی بەوە.

ئەوەی دەڵێی خەلیفەی تۆ لەئێمە نزیکە و لەبارودۆخی ئێمە ئاگادارە، دەبێت بڵێم ئەو نەدەتوانێت مەرگ پێش بخات یا دووری بخاتەوە بەهەمان شێوە کەناتوانێت رۆژانەی کەسێك فراوان یا کەم بکاتەوە. ئێمە هاندراوین بۆ ئەوەی رووبەرووی تۆ ببینەوە و بەخواستی خواوەند بەزوویی ئەمەت بۆ دەردەکەوێت.

نەسر نامەی هارونی نیشانی موعتەزیددا و ئەمە موعتەزیدی بۆ جەنگی هارون پێداگرتر کرد. ئەو حەسەن کوڕی عەلی کورەی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دیاری کرد و فەرمانی پێدا شوێنپێی خەواریج هەڵگرێت و فەرمانی بەهەموو فەرمانڕەواکان و کارگوزارەکانی ناوچەکەدا ملکەچی فەرمانەکانی حەسەن بن. حەسەن لەتەواوی ئەوان سوپایەکی کۆکردەوە و رووی کردە دەورووبەری موسڵ و بەدەوری سوپاکەی خەندەکی هەڵکەند و چاوەڕوان بوو تا خەڵکان بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی خۆیان کۆبکەنەوە. دواتر بەمەبەستی جەنگی خەواریج بەرێکەوت و لەزاب گوزەری کرد. ئەوان لەنزیك مەغلە رووبەرووی یەکبوونەوە و لەبەرابەر یەك سوپایان رازاندەوە. جەنگ و کوشتاری یەکیان دەست پێکرد. خەواریج بلاّو بوونەوە تا سوپاکەی حەسەن بلاّو ببنەوە و دواتر ناکاوگیری بکەن بەلاّم حەسەن فەرمانی بەسوپاکەیدا شوێنەکانی خۆیان بەجێنەهێڵن. ئەو کارەیان

کرد. خەواریج گەڕانەوە و حەڤدە جار هێرشیان کردە سەر حەسەن و سەرئەنجام باڵی ڕاستی سوپاکەی شکستی خوارد و ژمارەیەك لەسەربازەکانی کوژران بەڵام حەسەن خۆڕاگری کرد. خەواریج هاوشێوەی یەك جەستە هێرشیان کردەسەر. حەسەن دووبارە خۆڕاگری کرد. هەرچەند لەچەند شوێنێکەوە بریندار بوو بەڵام کاریگەری لەسەر دروست نەکرد.

کاتێك هاوەڵانی حەسەن خۆڕاگری ئەویان بینی، گەڕانەوە و خۆڕاگرییان کرد. بەم شێوەیە خەواریج شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و گۆڕەپانیان بەجێهێشت و ڕوویان کردە ئازەربایەجان.

هاروان مەبەستی سارای کرد و لەناو منداڵەکانی تەغلەب ئوردوی لێدا. دواتر بۆ مەعلەسایا گەڕایەوە و دووبارە ڕووی کردە سارا. دواتر لەڕێگەی دیجلەوە ڕووی کردە حەڕە و دووبارە ڕێگەی سارای گرتەبەر.

سەرانی سوپاکەی وەك بەختیاری کاتێك پێگەی موعتەزید و شکستی خۆیان لەم جەنگەدا بینی، نامەیان بۆ موعتەزید نووسی و داوای ئەمانیان لێکرد و پێیان بەخشرا. بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەکانی هارون هاتنە لای موعتەزید. ژمارەیان نزیکەی سێسەد و شەست کەس بوو. دەستەیەك لەگەڵ هارون لەم شار بۆ ئەو شار دەڕۆشتن تا ئەوەی هارون، وەك ئاماژەی پێدەدرێت، لەساڵی ٨٩٦/٢٨٣ زایینی کوژرا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەڕەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە، تەکتەمەر کوڕی تاشتەمەر قۆڵبەست کرا. ئەویان گرت و سامانەکەیان زەوت کرد. ئەو فەرمانڕەوای موسڵ بوو. دوای ئەو حەسەن کوڕی عەلی خوراسانی ناسراو بەکورە، فەرمانڕەوایەتی موسڵی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا کوڕی جەساس کچی خەمارەویەی کەمارە کراوی موعتەزید بوو، لەگەڵ یەکێك لەمامەکانی هێنایە بارەگای موعتەزید. موعتەزید لەم کاتەدا لەموسڵ بوو. لەم ساڵەدا موعتەزید بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەڕەبیع الاخر/ مەی کچی

خەمارەویەی بردە حیجلە.

لەم ساڵەدا موعتەزید رووی کردە رێگەی کێوەکان و گەیشتە کەرەج و دەستی بەسەر سامانەکانی باوکی دۆڵفدا گرت. نامەیەکی بۆ عومەر کوڕی عەبدولعەزیز نووسی و داوای ئەو گەوهەرەی کرد کەلای ئەو بوو. عومەر گەوهەرەکەی بۆ نارد و لەسەر رێگەی موعتەزید خۆی بەدوور گرت.

لەم ساڵەدا لۆلۆ کۆیلەی کوڕی تولون ئازاد کرا و سوار ئێستر و چوارپێکانیان کرد (بۆ رێز گرتن).

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی باوکی ساج لەگەڵ سوپایەك رووی کردە سەیمەرە بۆ هاوکاری فەتحی قەلابسی کۆیلەی موەفەق. ئەو و هاوەڵانی لەگۆڕەپانی جیهاد بۆ لای براکەی محەممەد لەمەراغە هەڵاتن. لەرێگە ئەو سامانەی بینی کەبۆ موعتەزیدیان دەبرد. دەستی بەسەر ئەو سامانەدا گرت. عوبەیدالله کوڕی عەبدوللە لەم بارەوە ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

امام الهدی انصارکم آل طاهر ... بلا سبب تخفون و الدهر یذهب

و قد خلطوا شکرا بصبر و رابطوا ... و غیرهم یعطی و یجبی و یهرب

واتاکەی: ئەی پێشەوای رێنوێنیکەر، هاوەڵانی ئێمە بنەماڵەی تاهیرن کەبێ ئەوەی گوناحێکیان ئەنجام دابێت، ئەوان لەخۆتان دوور دەکەنەوە و رۆژگار بەسەر دەچێت. ئەوان سوپاس و خۆڕاگرییان تێکەڵ کردووە و سنورەکانیان پاراستووە. لەکاتێکدا کەسانی دیکە پاداشتیان پێ دەدرێت و باج وەردەگرن و هەڵدێن.

لەم ساڵەدا موعتەزید وەزیرەکەی خۆی عوبەیدالله کوڕی سلێمانی بۆ لای کوڕەکەی لەڕەی ڕەوانە کرد. عوبەیدالله ڕۆشتە ڕەی و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی لەتەبەرستان سی و دوو هەزار دیناری بۆ محەممەد کوڕی وەردی عەتار نارد تا لەنێوان عەلەوییەکانی بەغداد، کوفە و مەدینە دابەشی بکات. سیخوڕەکان موعتەزیدیان لەمە ئاگادار کردەوە. محەممەد کوڕی بەدر بانگ کرا و لێپرسینەوەیان لەگەڵ کرد. ئەو دانی بەوەدا نا هەموو ساڵێك بەم ئەندازەی بۆ ڕەوانە دەکرێت و ئەو لەناو عەلەوییەکان دابەشی دەکات. بەدر ئەم هەواڵی بەموعتەزید راگەیاند. موعتەزید پێی وت: ئایا بیرتە ئەو

خەوەی بۆتۆم گێڕایەوە؟ بەدر وەڵامی دایەوە: نە، ئەی سەروەری باوەڕداران. موعتەزید وتی: لەخەودا بینیم وەك بڵێی مەبەستی نەهرەوانم بوو، کاتێك لەگەڵ سوپاکەی خۆم بەرێکەوتبووم، پیاوێکم بینی لەسەر تەپۆڵکەیەك نوێژی دەخوێند و گرنگی بەمن نەدا. سەرمسوڕما. کاتێك کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا، بەمنی وت: وەرە پێش. ڕۆشتمە پێش. وتی: ئایا دەمناسیت؟ وتم: نە. وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیبم. ئەمە بێلاسنە (خاکەناز) هەڵبگرە و زەوی هەڵکەنە. بێلاسنەکەم هەڵگرت و سەرقاڵ بووم. دواتر پێی وتم: منداڵەکانی تۆ بەئەندازەی چەقاندنی بێلاسن لەسەرزەوی، دەبنە جێگری تۆ، پێشنیاریان پێ بکە چاکە لەگەڵ منداڵەکانی من بکەن. بەم شێوەیە بەدر فەرمانیدا عەتار ئازاد بکەن و سامانەکانی بۆ بگەڕێننەوە. بەدر، فەرمانی بەعەتاردا نامەیەك بۆ سەروەری خۆی لەتەبەرستان بنوسێت و پێی بڵێت هەرچی دەخوازێت بەشێوەیەکی ئاشکرا بینێرێت و ئەویش بەشێوەیەکی ئاشکرا پارەکە لەناو خەڵکان دابەش دەکات. فەرمانیدا هەموان هاوکاری بکەن.

لەم ساڵەدا باوکی تەڵحە، مەنسور کوڕی موسلیم لەزیندانی موعتەزید مرد.

لەم ساڵەدا یەکێك لەکەنیزەکانی موعتەزید بەناوی شەغبە، منداڵێکی بۆ هێنایەدنیا کەناویاننا جەعفەر. ئەمە هەمان موقتەدیر (خەلیفەی داهاتووە).

لەم ساڵەدا خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون کوژرا. یەکێك لەخزمەتکارەکان لەزیحەجەجە/ ژانویە لەدیمەشق سەری بڕی. بیست و چەند خزمەتکار کەگومانی کوشتنی خەمارەویان لێدەکرا، کوژران.

هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بوو یەکێك ئاگاداری کردەوە کەنیزەکانی ماڵەکەی هەرکام کۆیلەیەکی خەساویان وەك هاوسەر بۆخۆیان هەڵبژاردووە. ئەو بەخەمارەویەی وت: ئەگەر دەخوازیت ڕاستی ئەم وتەت بۆ بسەلمێت، یەکێك لەکەنیزەکان بانگ بکە و ئەشکەنجەی بکە تا دان بەڕاستییەکاندا بنێت بۆ ئەوەی لەم ڕێگەوە هەموو شتێك بۆ ئاشکرا ببێت. خەمارەویە دەست بەجێ پەیکی بۆ لای جێگرەکەی خۆی لەمیسر نارد و فەرمانی پێدا چەند کەنیزێکی بۆ ڕەوانە بکات تا ڕاستی ئەم وتەی بۆ بسەلمێت. لەم کاتەدا دەستەیەك لەخزمەتکارەکان کۆبوونەوە و لەترسی ئاشکرا بوونی ئەم وتەیە بڕیاری کوشتنی ئەویاندا. ئەم دەستەیە کە

لەکەسە نزیکەکانی ئەو بوون، شەوانە سەریان بڕی و هەڵاتن.

کاتێك خەمارەویە کوژرا، سەرکردەکان کۆبوونەوە و کوڕەکەی، جەیش کوڕی خەمارەویەیان لەجێگەی باوك دانا. ئەو کەگەورەترین منالّی خەمارەویە بوو، لەدیمەشق لەگەڵ باوکی دەژیا. هێشتا منالّ و بێ ئەزمون بوو و دوای وەرگرتنی بەیعەت سامانێکی زۆری لەناو سەرکردەکان بلاّو کردەوە.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی سەعید کوڕی خالید باوکی سەعیدی داری، فەقیهی شافعی، مرد. ئەو ئەم زانستەی لەبوەیتی هاورێی شافیعی و ئەدەبی عەرەبی لەکوڕی ئەعرابی فێربیوو.

لەم ساڵەدا باوکی حەنیفە ئەحمەد کوڕی داودی دەینەوەری لوغەوی، نووسەری کتێبی (نەبات) مرد.

لەم ساڵەدا حارس کوڕی باوکی ئوسامە کە خاوەنی کتێبی (مسندی) لە-حەدیسە کە لەرۆژگاری ئێمە (رۆژگاری کوڕی ئەسیر) حەدیس لەو کتێبە دەگێڕنەوە، مرد. باوکی عەینا محەممەد کوڕی قاسم کە لەئەسمەعی حەدیسی دەگێڕایەوە، لەم ساڵەدا مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و سێی کۆچی ( ٨٩٦ زایینی )

### چۆنیەتی سەرکەوتن بەسەر هارونی خارجی

لەم ساڵەدا موعتەزید بۆ جەنگ لەگەڵ هارونی شاری بەرەو موسڵ بەرێکەوت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

چۆنیەتی سەرکەوتنی ئەو بەم شێوە بوو: کاتێك موعتەزید گەیشتە تکریت و لەوێ مایەوە، حسەین کوڕی حەمدانی تەغلەبی بانگ کرد و ئەوی لەگەڵ دەستەیەك سوار و پیادە بۆ شوێنپێ هەڵگرتنی هارونی شاری ڕەوانە کرد. حسەین پێی وت: ئەگەر هارون بێنمە لای سەرورەری باوەڕداران، سێ نیازم دەبێت. موعتەزید وتی: بڵێ. حسەین وتی: یەکیان ئازاد کردنی باوکم لەزیندانە و دوو داواکارییەکەی دیکە لەکاتی گەڕانەوەدا باسی دەکەم. موعتەزید ڕازی بوو. سێسەد سواری بۆ هەڵبژارد و حسەین لەگەڵ سوارەکان بەرێکەوت. وەسیف کوڕی موشگیر (مشك گر) لەناو سوارەکاندا دەبینرا. حسەین بەموعتەزیدی وت: فەرمان بەوەسیف بدە فەرمانبەری فەرمانی من بێت. موعتەزید فەرمانی بەوەسیفدا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی حسەین بێت.

حسین لەگەڵ سوپا ڕۆشت و لەکەنارەکانی دیجلە نزیك کەوتەوە. حسەین فەرمانی وەستانی بەوەسیف و سوارەکانی دیکەدا و پێی وتن: هارون جگە لێرە هیچ ڕێگەیەکی بۆ هەڵاتن نییە، کەواتە لێرە چاوەڕوان بن و ئەگەر هارون مەبەستی ئەوەی کرد لێرەوە بڕوات، ڕێگەی لێبگرن، چ لێرەبم یا هەواڵی کوژرانی منتان بەدەست گەیشتبێت.

حسەین شوێن هارون کەوت و ڕووبەڕووی بوویەوە. ژمارەیەك لەهەردوولا کوژران و سەرئەنجام، هارون شکستی خوارد. وەسیف سێ ڕۆژ لەکەناری دیجلە چاوەڕوان بوو. سەربازەکان پێیان وت: مانەوەمان لێرە درێژەی کێشا و ئەگەری هەیە حسەین هارون دیل بکات و ئەم سەرکەوتنە بەو ببڕێت و ئێمە لێی بێ بەش ببین. باشترە ئێمەیش بەدوایاندا بڕۆین. وەسیف گوێی لەقسەکانیان گرت و ملی

ڕێگەی گرتەبەر.

هارون لەکاتی هەڵاتن خۆی گەیاندە کەنارەکانی دیجلە و گوزەری کرد. حسەین شوێنی کەوت بەڵام وەسیف و سەربازەکانی لەشوێنەکەی خۆیان نەبینی. کەس نەیدەزانی بەکام لادا ڕۆشتون. حسەین شوێن هارون کەوت تا گەیشتە یەکێك لەئاوەدانییەکانی عەرەبەکان. سەبارەت بەو پرسیاری کرد بەڵام عەرەبەکان ئەویان شاردەوە. حسەین ئەوانی ترساند. عەرەبەکان پێیان وت کەحسەین لەوێ ڕۆشتووە. حسەین شوێنپێی هەڵگرت و چەند ڕۆژ دواتر خۆی گەیاندە هارون کەسەد کەس هاورێیەتیان دەکرد. هارون سوێندیدا و بەڵێنی پێدا بەڵام حسەین لەسەر جەنگ پێداگری کرد. جەنگی دەست پێکرد و لەگەرمەی جەنگەکە پەلاماری هارونیدا و ئەسیری کرد و هێنایە بارەگای موعتەزید. موعتەزید بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەبیست و دووی ڕەبیع الاوەل، دەی مەی، گەیشتە ئەو شارە.

موعتەزید خەڵاتی بەحسەین کوڕی هەمەدان بەخشی و نیشانی زێڕینی پێدا و ڕێزی لەبراکانیشی گرت. (دیاری بەوانیش بەخشی) هارونیان سوار فیل کرد و بەناو شاردا سوڕاندیانەوە. موعتەزید فەرمانیدا حەمدان کوڕی حەمدون ئازاد بکەن. دڵنەوایی کرد و دیاری پێبەخشی.

کاتێك هارونیان سوار فیل کرد، بڕیاریاندا بۆ ریسوا کردنی، دیبایەکی ڕەنگینی لەبەر بکەن. بەڵام هارون بەو کارە رازی نەبوو و وتی: ئەم کارە بۆ من شیاو نییە، بەڵام بۆ لەبەر کردنی ناچاریان کرد. کاتێك ویستیان لەداری بدەن، بەهەموو هێزییەوە هاواری کرد: هیچ حوکمێك نییە مەگەر حوکمی خواوەند، هەرچەند ناباوەڕان پێیان خۆش نییە. هارون شوێنکەوتەی ئایینی صوفرا (یەکێك لەلقەکانی خواریج بوو).

## شۆڕشی خەڵکانی دیمەشق دژی جەیش کوڕی خەمارەویە و ناسازگاری سوپا لەگەڵ ئەو وکوشتنی

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەسەرکردەکانی جەیش کوڕی خەمارەویە دژی ئەو شۆڕشیان کرد و بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و وتیان: ئێمە بەفەرمانڕەوایەتی تۆ ڕازی نین، دەست لەکار هەڵگرە تا مامت وەك فەرمانڕەوا هەڵبژێرین.

هۆکاری ئەم کارەیان ئەوە بوو چوونکە ئەو لەسەردەمی منداڵیدا فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، کەسە نەزان و بێ ئاوەزەکانی لەخۆی نزیك کردەوە و گوێی لەقسەکانی ئەوان دەگرت. ئەوانیش، بوونە هۆی دروست کردنی گومان و دڵپیسی لەسەرکردە و هاوەڵانی. جەیش بەردەوام قسەی ناشیرینی پێدەوتن و سەرکۆنەی دەکردن. بەئاشکرا باسی ڕەوانە کردنی ئەوان بۆ ناوچەکانی دیکە و زەوت کردنی سامانی ئەوانی دەکرد. سەرکردەکان بۆ کوشتنی ئەو و هێنانە سەرکاری مامی یەکیان گرت. جەیش لەم مەبەستە ئاگادار بوویەوە بەڵام نەیتوانی نهێنی بپارێزێت و دووبارە بەشێوەیەکی ئاشکرا ئیهانەی کردن. دەستەیەك لەسەرکردەکان بەجێیان هێشت و توغج کوڕی جوف، فەرمانڕەوای دیمەشق، ئەوی لەسەر کار لابرد.

ئەو سەرکردانەی لەو جیابوونەوە، ڕوویان کردە بەغداد. ئەم دەستەیە بریتی بوون لە: محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیق، خاقانی مولحی و بەدر کوڕی جوف، برای توغج و سەرکردە میسرییەکان. ئەوان بنەماڵە و سامانی خۆیان بەجێهێشت و ڕێگەی سارایان گرتەبەر. چەند ڕۆژێك ڕێگەیان ون کرد وچەند کەسێکیان لەتینویەتیدا مردن. سەرئەنجام گەیشتنە دوو مەنزڵی شاری کوفە و خۆیان گەیاندە بارەگای موعتەزید. موعتەزید ڕێزی گرتن وخەڵاتی پێ بەخشین.

ئەو سەرکردانەی لەمیسر مابوونەوە، لەگەڵ کوڕی خەمارەویە ناسازگار بوون. دەبیری کوڕی خەمارەویە، عەلی کوڕی ئەحمەدی مازەرائی، داوای لەنەیارەکان کرد ئەو ڕۆژە بلاوەی لێبکەن. ئەوان بلاو بوونەوە. جەیش دوو مامەکەی خۆی سەر

بڕی. بەرەبەیان سوپاییەکان دەوری کۆشکەکەیاندا و ئەو سەری براوی دوو مامەکەی هەڵدایە ناو ئاپۆڕەی ئەوان. سوپا هێرشیان کردەسەر و کوشتیان. سامانی ناو کۆشکەکەیان تالآن کرد. ئەوی لەمیسردا دەستیان کەوت، یا ڕفاندیان یا سوتاندیان و دوای جەیش هارونی برایان هێنایە سەر تەخت. جەیش کوڕی خەمارەویە بۆ ماوەی نۆ مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## گەمارۆی سەر قوستەنتەنییە لەلایەن سەقلەبییەکانەوە.

لەم ساڵەدا سەقلەبییەکان (نەژادی ئوسلۆ) هێرشیان کردە سەر ڕۆم و گەمارۆیان خستە سەرقوستەنتەنییە و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ئەو شارەیان کوشت و شارەکەیان وێران کرد. کاتێك پاشای ڕۆم بینی ناتوانێت لەبەرابەر سەقلەبییەکان خۆڕاگری بکات، ئەسیرە موسوڵمانەکانی کۆکردەوە و بەکەرەستەی جەنگ تەیاری کردن. داوای لێکردن بۆ جەنگ دژی سەقلەبییەکان هاوکاری بکەن. موسوڵمانەکان هاوکارییان کرد و سەقلەبییەکان شکستیان خوارد و لەقوستەنتەنییە هەلآتن. کاتێك پاشای ڕۆم، هێزی موسوڵمانەکانی بینی، ترسی کەوتە دڵ و ئەوانی بۆ زیندانەکان گەڕاندەوە. کەرەستەکانی جەنگیان لێ سەندن و لەناو شاردا بلأوی کردەوە بۆ ئەوەی لەلایەن موسوڵمانەکانەوە زیانی بەرنەکەوێت.

## ئاڵ وگۆڕی ئەسیرەکان لەنێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان

لەم ساڵەدا موسوڵمانان و ڕۆمییەکان ئەسیرەکانیان ئاڵ و گۆڕ کرد. هەموو ئەسیرە موسوڵمانەکان لەژن و پیاو و منالٚ، دوو هەزار و پێنسەد و چوار کەس بوون.

## جەنگی سوپاکەی موعتەزید لەگەڵ منداڵەکانی باوکی دۆڵف

لەم ساڵەدا عوبەیداللە کوڕی سلێمان، هێرشی کردە سەر عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دۆڵف لەکوێستان. عومەر لەشەعبان/ سێپتامبەری ئەم ساڵە داوای ئەمانی کرد و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی نیشاندا. موعتەزید خەڵاتی بەخۆی و بنەماڵەکەی بەخشی.

پێشتر بەکر کوڕی عەبدولعەزیز لەعوبەیداللە کوڕی سلێمان و بەدر (نوێنەری خەلیفە) داوای ئەمانی کردبوو. ئەو دوانە ئەمانیان پێ بەخشی و سنووری فەرمانڕەوایەتی براکەیان بەو سپارد بەڵام کاتێك عومەر داوای ئەمانی کرد، سلێمان و بەدر پێیان وت کەبراکەی ملچکەی خۆی بۆ فەرمانەکان دەر بڕیوە و ئێمە بۆیە ئەم کارەمان بەتۆ سپارد چوونکە ئەو ڕێگەی ناسازگاری گرتبووە بەر. هەنووکە هەردووکتان بڕۆنە بارەگای موعتەزید تا ئەو فەرمانی خۆی لەمبارەوە دەربکات.

نەوشەری وەك فەرمانڕەوای ئیسفەهان دیاریکرا و وای نیشاندا لەلایەن عومەر کوڕی عەبدولعەزیزەوە بۆ ئەو کارە راسپێردراوە. بەکر کوڕی عەبدولعەزیز هەڵات. عوبەیداللە ئەم هەواڵەی بۆ موعتەزید نووسی. موعتەزید فەرمانی بۆ بەدر نووسی تا روون بوونەوەی بارودۆخی بەکر لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە.

وەزیر (عوبەیداللە) بۆ سەردانی عەلی کوڕی موعتەزید ڕێگەی ڕەی گرتەبەر. بەکر کوڕی عەبدولعەزیز رووی کردە ئەهواز. موعتەزید، وەسیف کوڕی موشگیر بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. وەسیف لەسنورەکانی فارس پێی گەیشتەوە و هەر دوو سوپا لەبەرابەر یەك و لەئوردووگای خۆیان، شەویان کردە رۆژ. بەکر شەوانە بۆ ئیسفەهان هەڵات بەڵام وەسیف شوێنی نەکەوت و بۆ بەغداد گەڕایەوە و بەکر رووی کردە ئیسفەهان.. موعتەزید فەرمانی بۆ بەدر نووسی تا شوێنپێی بەکر هەڵگرێت و شەڕی لەگەڵ بکات. عیسا هەمان فەرمانی بۆ نەوشەری نووسی و بەکر ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| عنى ملامك ليس حين ملام | هيهات احدث زائد اللوام |
| ظارت عنايات الصبا عن مفرقى | و مضى اوان شراستى و غرامى |
| القى الاحبة بالعراق عصيهم | و بقيت نصب حوادث الايام |
| و تقاذفت باخى النوى و رمت به | رمى العبيد قطيعة الارحام |
| فلا قرعن صفاة دهر نابهم | قرعا يهز رواسى الاعلام |
| و لا ضرين الهام دون حريمهم | ضرب القدار بقيعة القدام |
| و لا تركن الواردين حياضهم | بقرارة لمواطىء الاقدام |
| يا بدر انك لو شهدت مواقفى | و الموت يلحظ و السيوف دوامى |
| لذممت رايك فى اضاعة حرمتى | و لضاق ذرعك فى اطراح ذمامى |
| حركتنى بعد السكون و انما | حركت من حصن جبال تهام |
| و عجمتى فعجمت منى مرجما | خشن المناكب كل يوم زحام |
| قل للامير ابى محمد الذى | يجلو بغرته دجى الاظلام |
| اسكنتنى ظل العلا فسكنته | فى عيشة رغد و عز نام |
| فلا شكرن جميل ما اوليتنى | ما غردت فى الايك ورق حمام |
| هذا ابو حفص يدى و ذخيرتى | للنائبات و عدتى و سنامى |
| ناديته فأجابنى و هزرته | فهزرت حد الصارم الصمصام |
| من رام ان يغضى الجفون على القذى | او يستكين يروم غير مرام |
| و يخيم حين يرى الاسنة شرعا | و البيض مصلتة الضرب الهام |

واتاکەی: سەرکۆنە کردن پشت گوێ بخە چوونکە کاتی سەرکۆنە کردن نییە، دوور بێت چوونکە سەرکۆنە کەران زێدەڕۆییان کردووە. نیشانەی گەنجی لەناوچاوی من کۆچی کرد و کاتی سەرسەختی و عەشقبازی کۆچی کردووە. هاوەڵانی من لەعێراق (ئەراکی ئێستا کەسەرزەمینی باوکی دۆڵف بوو) گۆچانیان داناوە (نیشتەجێ بوون) و من بوومەتە نیشانەی ڕووداوەکانی ڕۆژگار. دووری، براکەمی هاوشێوەی کۆیلەکان لەسوچێکدا فڕداوە و پەیوەندی ئێمە پچڕاوە. من بەبەرد ڕیزیان لێدەگرم، ڕێز گرتنێك کەکێوە گەورەکان بلەرزێنێت. من بۆ بەرگری کردن لەکەسانی ناو پەردەی ئەوان، سەرەکان دەپەڕێنم بەهەمان شێوە

کەبەندەیەکی چالاك بۆ میوانداری سەری وشتر دەبڕێت. من ئەوکەسانەی دەبێت لەسەر ئاوی ئەوان تێراو بێن و بڕۆنە سەر ئاوگرەکانی ئەوان، پێشێل دەکەم (رێگە نادەم کەس دەستدرێژی بکاتە سەر ئەوان. ئەی بەدر، ئەگەر تۆ بوێری منت لەجەنگدا دەبینی، ئەو کاتەی مەرگ سەیری دەکردم و شمشێرەکان خوێناوی دەبوو، ئەندێشەی خۆت بۆ ریسوا کردنی من سەرکۆنە دەکرد و بۆ دوورخستنەوەی من دڵتەنگ و پەشیمان دەبوویت. تۆ دوای ئارامی منت هێنایە جموجۆڵ و لەقەڵاوە کێوەکانی تەهامت لەراندەوە. تۆگوشارت خستە سەر من و ئەزمونت کردم و بۆت دەرکەوت کەسێکت ئەزمون کردووە کە لەرۆژی جەنگ پشتیوانی دەکات پاڵەوانی چوارشانەی بەهێز. بەئەمیر باوکی محەممەد کە لەرووناکی ئەو تاریکی لەناو دەچێت، بڵێ: تۆ منت لەسێبەری لەپیشی لەژیانێکی ئاسوودە و رێزداری جێگە کردەوە، کاتێك ماڵئاواییت لەمن کرد، بەدبەختی من دەستی پێکرد و رۆژگاری من پێچەوانە بوو. تا ئەو کاتەی کۆتەر و مەل لەسەر دارەکان بخوێنن، لەچاکەکاری تۆ بۆخۆم سوپاسگوزارم. ئەمە باوکی حەفسە کە لەکاتی پێشهاتنی دژوارییەکان، دەست و بازووی کۆکردۆتەوە و پەناگەی منە. داوای هاواریم لێکرد و وەڵامی دامەوە. ئەوم وەك شمشێرێکی بڕەر لەناو دەستدا راوەشاند. هەرکەس چاو لەریسوایی بپۆشێت یا بەریسوایی رازی ببێت، جیاوازە لەمن. ئەو کاتێك کەدەبینێت رمەکان هاوێژراون بۆ ئەوەی سەرەکان بپەرێنن، خێوەت هەڵدەدات.

سەرەئەنجام نەوشەری لەبەدر شکستی خوارد و بەکر ئاماژەی بەهەڵاتنی ئەو کرد و سەرکۆنەی وەسیفی کرد چوونکە لەهاوکاری کردنی ئەو خۆی دوورخستەوە و بەدری بەم هۆنراوەیە ترساند:

| | |
|---|---|
| قد رای نوشری حین التقینا | من اذا اشرع الرماح یفر |
| جاء فی قسطل لهام فصلنا | صولة دونها الکماة تهر |
| و کوی النوشری آثار نار | رؤیت عند ذاك بیض و سمر |
| غر بدرا حلمی و فضل اناتی | و احتمالی للعبء مما یغر |

سوف یاتیه من خیولی قب — لاحقات البطون جون و شقر

یتنادرن کالسعالی علیها — من بنی وائل اسود تکر

لست بکرا ان لم ادعهم حدیثا — ما سری کوکب و ما کر دهر

واتاکەی: کاتێك ڕووبەڕوو بووینەوە نەوشەری زانی کام یەك لەئێمە ئەگەر ڕمێك بهاوێژرێت، هەڵدێت. ئەو لەگەڵ سوپایەکی گەورە هات و بەشێوەیەك هێرشمان کرد کەبوێرەکان سەریان سوڕدەمێنێت. نەوشەری ئاگری کردە نیشانە و ئەو ئاگرە لەشمشێر و ڕمەکان دروست بوو. بەدر بەهۆی خۆڕاگری و بوێری من چاوی زەق ببوو، هەروەها فراوانی خۆڕاگری و چاوەڕوانی من و پشت تێکردنی من لەکەمێك ئاوزی خۆ پەسەند، بۆتە هۆکاری فریودرانی ئەو. لەسوارەکانی هەرچەند بوێر و ئازایە، بەو دەگات کە سوار ئەسپە لەڕەکان و سك بەقووڵاچووەکانن. سور و ڕەشی ئەو سوارانە وەك دیوان لەسەر سەرەوەی ئەو ئەسپانەیە و هەی، لەیەك دەکەن. ئەو سوارانە لەمناڵەکانی وائیلی شیرانین کەهێرش دەبەن. لەبەکرییەکان نابم ئەگەر دوژمنەکانم نەکەمە ئەفسانە کە ئەم ئەفسانەیە بەدەرکەوتنی ئەستێرەکان و سوڕانی ڕۆژگارە، بەردەوام وێردی سەرزمانەکان بێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موعتەزید نامەی بۆ هەموو شارەکان نووسی تا زیادەی بەشی میراتی مردوو (کەحکومەت وەری دەگرت) بۆ کەسانی مردووەکە بگەڕێننەوە و دیوانی میرات دابخرێت.

لەشەوال/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، محەممەد کوڕی باوکی شەواربی قازی مرد. ماوەی داوەری کردنی ئەو لەشاری مەنسور (بەشێك لەبەغداد) شەش مانگ درێژەی کێشا.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دوڵف هاتە بەغداد و موعتەزید فەرمانی بەخەڵك و سەرکردەکاندا پێشوازی لێ بکەن. موعتەزید بۆ پێشوازی کردنی ئەو دانیشت. عومەر هاتە لای موعتەزید و ڕێزی لێگیرا و خەڵات

کرا.

لەرەمەزان/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە لەنێوان عەمرۆ کوڕی لەیسی سەفار و رافیع کوڕی هەرسیمە جەنگ روویدا و رافیع شکستی خوارد. هۆکاری ئەم جەنگە ئەوە بوو عەمرۆ لەنەیشابور هاتەدەر و رافیع نەبوونی ئەوی بەهەل زانی و دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت و بەناوی محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی وتاری خوێندەوە. عەمرۆ لەمەرو بۆ نەیشابور گەڕایەوە و گەمارۆی خستە سەر شارەکە. رافیع هەڵات. عەمرۆ دەستەیەکی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد و ئەم دەستەیە لەتوس خۆی پێگەیاند. رافیعی لەدەست ئەم دەستەیە هەڵات و رووی کردە خوارەزم و لەوێ پێی گەیشتنەوە و ئەم جارە خوێنیان ڕشت و سەریان بۆ لای عەمرۆ ڕەوانە کرد. عەمرۆ سەری ئەوی بۆ موعتەزید ڕەوانە کرد. سەری رافیع لەموحەرەمی ٢٨٤/ مارسی ٨٩٧ زایینی گەیشتە بارەگای موعتەزید. ئەو، فەرمانیدا سەری رافیع بەڕمەوە هەڵواسن ودیاری بەنێردراوەکان بەخشی.

لەم ساڵەدا بوحتەری وتارخوێن مرد. ناوی وەلید کوڕی عوبادە بوو. ئەو لەمەنبەج یا حەلەب مرد. لەساڵی ٨٢١/٢٠٦ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی سلێمان ئەبوبەکر ناسراو بەکوڕی باغەندی و باوکی حەسەن عەلی کعەباسی جوەریحی وتاردەر ناسراو بەکوڕی رۆمی، هەردووکیان مردن. دەستەیەك ساڵی مردنی کوڕی رۆمی لە٨٩٧/٢٨٤ زایینی دەزانن. ئەو دیوانێکی بەناو بانگی هەیە.

لەم ساڵەدا سەهل کوڕی عەبدوللە کوڕی یونس کوڕی روفەیع سەری کە لەساڵی ٨١٥/٢٠٠ زایینی یا بەگومانێك لەساڵی ٨١٦/٢٠١ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و چواری کۆچی ( ٨٩٧ زایینی )

لەم ساڵەدا لەشاری تەرسوس لەنێوان راغب، خزمەتکاری موەفەق و دەمیانە، ناسازگاری هاتە ئاراوە. هۆکاری ئەم ناسازگارییە ئەوە بوو راغب لەخوێندنەوەی خوتبە بەناوی هارون کوڕی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون خۆی بەدوور گرت و بەناوی بەدری خزمەتکاری موعتەزید خوتبەی خوێندەوە. لەبەر ئەمە لەنێوان ئەو و ئەحمەد کوڕی توغان دوژمنایەتی کەوتەوە. کاتێك ئەحمەد کوڕی توغان لەساڵی ٨٩٦/٢٨٣ زایینی لەئاڵ و گۆڕی دیلەکان گەڕایەوە، بێ ئەوەی بڕواتە تەرسوس، لەرێگەی دەریاوە گەڕایەوە و دەمیانەی وەك جێگری خۆی دانا تا کاروبارەکانی ئەو لەو ناوچەیە هەڵسوڕێنێت و کوڕی توغانیش هاوکاری بکات. پێگەی ئەو بەرز بوویەوە و کردەوەکانی راغبی بەقێزەون لەقەڵەمدا و بەم شێوەیە جەنگ لەنێوانیاندا هەڵگیرسا. لەکۆتاییەدا راغیب سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دەمیانەی گرت و ڕەوانەی بەغدادی کرد.

لەم ساڵەدا عیسا کوڕی نەوشەری لەکەنارەکانی ئیسفەهان ڕووبەڕووی بەکر کوڕی عەبدولعەزیز بوویەوە و جەنگاوەرەکانی کوشت و ئوردووگاکەی تالان کرد. بەکر لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەهاوەڵانی گیانی بەدەر برد. بەکر بەرەو تەبەرەستان و بۆ پەیوەست بوون بە محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی هەڵات و تا ساڵی ٨٩٨/٢٨٥ زایینی لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی مرد. کاتێك موعتەزید هەواڵی مەرگی ئەوی بیست، هەزار دیناری بەو کەسە بەخشی کەهەواڵەکەی بۆ هێنابوو.

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە باوکی عومەر یوسف کوڕی یەعقوب لەجێگەی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی باوکی شەوارب وەك قازی شاری مەنسور دەست بەکار بوو.

لەم ساڵەدا خزمەتکارێکی مەسیحی غالیب دەستگیرکرا. دەستەیەك شایەتیاندا کەئەو جوێنی بە پێغەمبەر(د.خ) داوە. دانیشتوانی بەغداد کۆبوونەوە و هاواریان لەقاسم کوڕی عوبەیدالله کرد و داوایان لێکرد سزای ئەم خزمەتکارە بدات بەڵام ئەو لەمکارە خۆی بەدوور گرت. دواتر دەستەیەك بەرەو کۆشکی موعتەزید

بەرێکەوتن. موعتەزید لەهۆکاری ئەم کۆبوونەوەی پرسی و ئەوان بەسەرهاتەکەیان بۆ باس کرد. موعتەزید خزمەتکارەکەی لەگەڵ دەستەیەك بۆ لای باوکی عومەری قازی ڕەوانە کرد. زۆری نەمابوو ئەم خزمەتکارە لەناو قەرەباڵغی خەڵکاندا پێشێل بکرێت. لەم کاتەدا دەرگایەکی کراوەی بینی، خۆی خستە ناوماڵەکە و دەرگاکەی بەست. چیتر نەنیشانەیەك لەو خزمەتکارە بینرا نە لەکۆبوونەوەی خەڵکان.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەدانیشتوانی تەرسوس هاتنە بارەگای موعتەزید و داوایان لێکرد فەرمانڕەوایەکیان بۆ دیاری بکات چوونکە ئەوان کوڕی تولونیان لەشارەکە دەرپەڕاندبوو. موعتەزید کوڕی ئەخشیدی ئێرانی وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ ئاوریل لەئاسمانی میسر ڕەشی و سوری فراوان بەرچاو کەوت بەشێوەیەك ئەگەر کەسێك سەیری یەکی دیکەی دەکرد، روخساری ئەوی بەسور دەبینی. ئەم بارودۆخە لەنیمەڕۆوە تا بەشێك لەشەو درێژەی کێشا. خەڵك لەماڵەکانیان هاتنەدەر و پاڕانەوەیان بۆ بارەگای پەروەردگار دەست پێکرد.

لەم ساڵەدا موعتەزید فەرمانیدا لەسەر مینبەرەکان نفرینی معاویە کوڕی ئەبو سوفیان بکەن و فەرمانیدا پەرتوکێك بنوسن و بۆ خەڵکانی بخوێننەوە. پەرتوکێکی ئەستور بوو کە بەباشترین شێوە نوسرا بوو. لەم کتێبەدا حەدیسی ژمارەیەکی زۆر وەك بەڵگە ئاماژەی پێدرابوو کەبەپێی ئەو حەدیسانە، پێغەمبەر(د.خ) نفرین کردنی معاویە بەئەرکێکی پێویست لەقەڵەم داوە. ئەم حەدیسانە راست نەبوون. هەروەها ئاماژە بەنفرین کردنی یەزید و ئومەوییەکانی دیکە درابوو. چەندین پەرتووکیان لەم کتێبە گرتەوە (نووسیەوە) و لەهەردوولای بەغداد بۆ خەڵکان دەخوێندرایەوە. موعتەزید، ڕێگەی دانیشتن لەدوو مزگەوتی هەینی یا لەحەوشی مزگەوتەکان لەخەڵکان و قازییەکان بۆ لێکۆڵینەوە و گفتوگۆکردن سەبارەت بەکارە دینییەکان و بیرهێنانەوەی معاویە گرت. عوبەیدالله کوڕی سلێمانی وەزیر پێی وت: لەپەرێشانی و شۆڕشی ئەوان دەترسم بەڵام موعتەزید گرنگی بەوتەکانی نەدا. عوبەیدالله بەیوسف کوڕی یەعقوبی قازی وت بۆ پەشیمان کردنەوەی

موعتەزید لەم بڕیارە ئەندێشەیەك بكات. یوسف لەگەڵ موعتەزید ئاخاوت و لەجموجۆڵی خەڵكان ئاگاداری كردەوە بەڵام موعتەزید گرنگی بەوتەكانی ئەویش نەدا. یوسف بەموعتەزیدی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی بكەین لەگەڵ ئەو تالبییانەی (منداڵەكانی تالیب) كە ڕۆژانە لەكەنارەكان سەر بەرز دەكەنەوە و ژمارەیەكی زۆر لەخەڵكان بەهۆی نزیكی ئەوان لە پێغەمبەر(د.خ) پەیوەستیان دەبن؟ ئەگەر خەڵكان نووسراوەكانی ئەم كتێبە سەبارەت بەوەسف كردنی تالبییەكان بخوێننەوە، زیاتر لەجاران ئارەزوومەندی پەیوەست بوون بەوان دەكەن بەتایبەت ئەوەی كەئێستا عەلەوییەكان لەپاراوترین زمان و ئاشكراترین بەڵگەكان كەڵك وەردەگرن. ئەم وتانە موعتەزیدی لەبڕیارەكەی پەشیمان كردەوە و چیتر سەبارەت بەم كتێبە هیچ بڕیارێكی دەرنەكرد. عوبەیدالله لەخراپەخوازانی عەلی كوڕی ئەبی تالیب بوو.

لەم ساڵەدا موعتەزید ئاڵای فەرمانڕەوایەتی ڕەی لەگەڵ چەندین خەڵاتی گرانبایی بۆ عەمرۆ كوڕی لەیس ڕەوانە كرد.

لەرەجەب/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە، قەرڕە لەشارەكانی ڕۆم لەسەر دەستی راغب، موالی موفەق، و كوڕی كلوب دەستی بەسەردا گیرا.

لەشەعبان/ سێپتامبەری ئەم ساڵە لەكۆشكی موعتەزید پیاوێكی شمشێر بەدەست دەركەوت. یەكێك لەخزمەتكارەكان ڕۆشتە پێش تا روخساری ببینێت. ئەو پیاوە خزمەتكارەكەی بریندار كرد. خزمەتكار هەڵات و پیاوی شمشێر بەدەست خۆی لەناو كۆشكەكەی موعتەزیددا شاردەوە. شەو و ڕۆژێك بەدوایدا گەڕان بەڵام هیچ شوێنەوارێكی لێ نەبینرا. موعتەزید ترسی لێ نیشت و خەڵكان سەبارەت بەم پیاوە قسەیان دەكرد تا ئەو جێگەی بەپەری ناویان دەبرد. ئەو چەندین جاری دیكە دەركەوتەوە تا ئەو جێگەی موعتەزید كۆشكەكەی پڕ كرد لەپاسەوان. دواتر جادووگەرانی هێنایە كۆشكەكەی و سەبارەت بەم پیاوە پرسیاری لێكردن. جادوگەران و جنۆكەگران پێیان وت لەسەر شێتێك ئەفسونێك هەڵدەواسین و كاتێك دێو لەجەستەكەی بێتەدەر، ئاگادارمان دەكاتەوە. ئەفسونێكیان بەژنێكی شێتەوە هەڵواسی و ژنەكە بێ هۆش كەوتە سەرزەوی.

موعتەزید سەیری دەکرد. کاتێك ژنەکە بێ هۆش کەوت، موعتەزید فەرمانی گەڕانەوەی پێدان.[١٩]

لەم ساڵەدا کەرامە کوڕی موڕ دەستەیەکی قۆڵبەست کراو لەکوفەوە ڕەوانە کرد. ئەو، ئەوانی بەقەرەمتییەکان دەزانی. فەرمانی لێدان و ئەشکەنجە کرانی ئەوان دەرکرا تا هاودینەکانی خۆیان ئاشکرا بکەن. ئەوان دانیان بەوەدا نا کەباوکی هاشم کوڕی سەدەقە، نووسەری ئەوانە. باوکی هاشمیان گرت و زیندانیان کرد.

لەم ساڵەدا حارس کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دوڵف ناسراو بەباوکی لەیلی، هێرشی کردە سەر شەفیعی خزمەتکار و کوشتی. برای حارس، عومەر کوڕی عەبدولعەزیز براکەی خۆی گرتبوو و لەقەلاکەی خۆی بەناوی ڕەز زیندانی و شەفیعی خزمەتکاری لەگەڵ دەستەیەکی دیکە بۆ چاودێری کردنی ئەو راسپاردبوو. عومەر داوای ئەمانی لەموعتەزید کرد و بەکڕ هەلات. بەم شێوەیە قەلا و سامانەکەی کەوتە دەستی شەفیع. باوکی لەیلی داوای لەخزمەتکارەکەی خۆی کرد سۆهانێکی بۆ بیات. ئەو سۆهانی کردە ناو خواردنەکەی باوکی لیلی و بەم شێوەیە توانی زنجیرەکەی خۆی بپڕێت.

شەفیع هەموو شەوێك دەهاتە لای باوکی لەیلی و لەباروودۆخی ئەوی دەپرسی و ئەوسا دەڕۆشتە جێگەکەی خۆی و دەخەوت و شمشێرێکی لەژێر سەری دادەنا. شەوێك شەفیع ( دوای ئەوەی باوکی لەیلی بەشێوەیەکی نهێنی زنجیرەکەی خۆی قرتاندبوو))، هاتە لای باوکی لەیلی و قسەی لەگەڵ کرد. باوکی لەیلی داوای لەشەفیع کرد چەند پیاڵەیەکی لەگەڵ بخواتەوە. شەفیع رازی بوو. لەم کاتەدا شەفیع بۆ ئەنجامدانی کارێك ڕۆشتەدەر. باوکی لەیلی چەند دەست جل و بەرگی لەشوێن خەوەکەی خۆی دانا و بەکەنیزە خزمەتکارەکەی وت:، هەرکات شەفیع گەڕایەوە، پێی بلێ من خەوتووم. باوکی لەیلی لەدەرەوەی ماڵەکەی خۆی

---

[١٩]- لەکتێبی النجوم الزاهردا هاتووە: دوای مردنی موعتەزید دەرکەوت ئەو پیاوە شمشێر بەدەستە یەکێك لەکۆیلەکانی موعتەزید بوو. ئەوو عاشقی یەکێك لەکەنیزەکان بوو. لەبەر ئەوەی موعتەزید منالی کۆیلەکانی لەکاتی بالغ بوون لەکۆشکەکەی دەردەکرد و ئەم کوڕەیش گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو و لەدەرەوەی کۆشکەکە ژیانی بەسەر دەبرد. لەگەل خۆشەویستەکەی ژوانی دانابوو ئەگەر بەشمشێرەوە دەرکەوت، ئەویش بێتەدەر و بڕواتە لای. ئەو لەگەڵ کەنیزە خۆشەویستەکەی دەڕۆشتە ناو باخەکە و چێژی لێ وەردەگرت. (وەرگێڕ)

شاردەوە. کاتێك شەفیع گەڕایەوە، کەنیزەکە پێی وت باوکی لەیلی خەوتووە. شەفیع دەرگاکەی بەست و گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. لەم کاتەدا باوکی لەیلی دەرکەوت و شمشێرەکەی لەژێر سەری شەفیع هەڵگرت و کوشتی. کۆیلەکان خۆیان گەیاند. باوکی لەیلی پێی وتن: من شەفیعم کوشتووە، هەرکەس بێتە پێش دەکوژرێت، ئێوە هەمووتان ئەمانتان هەیە. ئەوان لەماڵەکە ڕۆشتنەدەر. دواتر خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و ئەو قسەی بۆ کردن و بەڵێنی چاکەکاری پێدان و پەیمانی لێوەرگرتن. کوردەکان و کەسانی دیکە دەستی هاوکاریان بۆ درێژ کرد و ئەو دژی موعتەزید ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. شەفیع لەمانگی زیقەعدە/ نۆڤەمبەر کوژرا.

کاتێك باوکی لەیلی ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە، عیسا نەوشەری بەمەبەستی ڕووبەرووی بوونەوەی ئەو خۆی ئامادە کرد. دوو سوپا ڕووبەرووی یەکبوونەوە و تیرێك لەقوڕگی باوکی لەیلی چەقی و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. هاوەڵانی باوکی لەیلی هەڵاتن و سەری ئەو سەرەتا بۆ ئیسفەهان و دواتر ڕەوانەی بەغداد کرا.

لەم ساڵەدا ئەستێرەناسەکان پێشبینیان کرد کەزۆربەی سەرزەمینەکان جگە لەبابل بەهۆی بارانی فراوان و زۆربوونی ئاوی ڕووبارە وسەرچاوەکان نغرۆ دەبن بەڵام (بەپێچەوانەی ئەم گومانە) وشکەساڵی دەرکەوت و باران کەم و ئاوەکان وشکیان کرد و خەڵکان دۆعای نوێژەبارانەیان خوێند. لەبەغداد چەندین جار بۆ بارینی باران، خەڵکان نوێژی بارانیان خوێند.

محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی داودی هاشمی ناسراو بەئەترەنجە لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ حاجییەکان ئەنجامدا.،

لەم ساڵەدا هارون کوڕی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون لەمیسر گرفتاری مالیخۆلیا بوو. سەرکردەکان ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەروچاوی تەماحیان تێبڕی و بەم شێوەیە شیرازەی کارەکان تێکچوو و هاوهەڵوێستی لەئارادا نەما. دواتر بڕیاریاندا باوکی جەعفەر کوڕی ئەبا(ن) وەك هەڵسوڕێنەری کاروبارەکان دیاری بکەن. ئەو لای باوك و باوەگەورێی هارون پێگەیەکی بەرزی بوو و بەئەندازەی توانای خۆی، کاروبارەکانی ڕێکدەخست. سوپاییەکانی

دیمەشق وەك ئاماژەی پێدرا، لەگەڵ براکەی هارون، جەیش کوڕی خەمارەویە ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر. کاتێك باوکی جەعفەر هاتە سەر کار، سوپایەکی بەفەرمانەیی بەدری حومامی و حسەین کوڕی ئەحمەدی مازەرائی بۆ دیمەشق ڕەوانە کرد. ئەم دووانە بارودۆخی ئەوشارەیان سەقامگیر کرد. ئەم دوانە، توغج کوڕی جوفیان وەك فەرمانڕەوای دیمەشق دەستنیشان کرد. هەرکام لەسەرکردەکان فەرماندەیی سوپایەکی لەئەستۆدا بوو و فەرمانی دەبێت و نەبێتەکانی پێدەکرد. بەم شێوەیە شیرازەی حکومەتەکان هەڵدەوەشێت. هەرکات خواوەند مەبەستی ئەنجامدانی کارێك بکات، دەیهێنێتەدی و بەئەنجامی دەگەیێنێت.

لەمساڵەدا ئیسحاق کوڕی موسا کوڕی عیمران باوکی یەعقوبی ئەسفراینی، فەقیهی شافیعی و غەیاسی بەناوی عەبدولعەزیز کوڕی معاویە لەمناڵەکانی غەیاس کوڕی ئەسید هەردووکیان مردن.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی وەزاحی ئاندۆلۆسی فرەزان مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و پێنجی کۆچی ( ٨٩٨ زایینی )

لەموحەرەم/ ژانویەی ئەم ساڵە، ساڵح کوڕی مودرەکی تایی لەئەجفەر حاجییەکانی ڕووت کردەوە و حوبی کەبیر[٢٠] کەسەرکردەی کاروانەکە بوو، ڕووبەڕووی بویەوە بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەسەر ئەو و عەرەبەکانی هاوەڵی بەدەست بێنێت و ساڵح دەستی بەسەر کاروانەکەدا گرت و عەرەبەکان، سامان و کەنیز و کۆیلەکانیان فڕاند. بەهای سامانە تاڵان کراوەکە بەدوو هەزار دینار دەخەملێنرا.

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی لەیس بەفەرمانی خەلیفە فەرمانڕەوایەتی ماوەرا ئەلنەهری گرتەدەست و ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی لەکار دوور خرایەوە.

لەم ساڵەدا زەردبایەك لەکوفە هەڵیکرد و تا ئێوارێ بەردەوام بوون. دواتر بەبارەش جێگەی پڕ کرایەوە. خەڵکان کەوتنە شین و ڕۆڕۆ و بەدوای ئەوە بارانی خوڕ دەست بەبارین کرد کەهاورێ بوو لەگەڵ هەورەبروسکە مەترسیدارەکان. دوای کاژێرێك لەگوندی ئەحمەد ئاباد، بەردی ڕەش و سپی لەئاسمان دەکەوتە خوار کەناوەکەیان چاڵ بوو. ئەم بەردانەیان بردە بەغداد تا خەڵکان بیبینن.

لەم ساڵەدا فاتك، کۆیلەی موعتەزید، بەرەو موسڵ و دەوروبەری موسڵ و جەزیرە و سنورەکانی شام و جەزیرە بەرێکەوت تا کاروبارەکانی ئەم ناوچەیە سامان بدات. ئەو سەرپەرەستی بەریدیشی لەئەستۆدا بوو.

لەم ساڵەدا زەردبا لەبەسرە هەڵیکرد و دوای کەمێك ڕەنگەکەی بۆ سەوز گۆڕا و دواتر ڕەش. دوای ئەمە بارانێکی خوڕ دەستی بەبارین کرد کەکەس هاوشێوەی نەبینیوو. بەدوای ئەمە بارینی تەرزە دەستی پێکرد. وەك دەگێڕنەوە قورسایی هەر دەنکە تەرزەیەك بەسەد و پەنجا درهەم دەگەیشت.

لەم ساڵەدا خەلیل کوڕی ڕەماڵ لەحیلوان چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا موعتەزید، محەممەد کوڕی باوکی ساجی وەك فەرمانڕەوای

---

[٢٠]- لەمێژووی تەبەری بە حەی کەبیر ناوی هاتووە. (وەرگێڕ)

ئازەربایەجان و ئەرمەنستان دیاری کرد. محەممەد کوڕی باوکی ساج پێشتر دەستی بەسەر ئەم سامانەدا گرتبوو و ڕێگەی ناسازگاری گرتبووە بەر. موعتەزید بەناچاری فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ نارد..

لەم ساڵەدا راغیب، کۆیلەی موەفەق، جەنگی دەریایی ئەنجامدا و چەندین کەشتی وەك تالانی دەست کەوت. و سەری سێ هەزار ڕۆمی و سەرنشینی ئەم کەشتییانەی جیا کردەوە و کەشتییەکانی سوتاند. دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت و لەگەڵ سوپاکەی بێ هیچ زیانێك گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخ مرد و دوای ئەو کوڕەکەی لەئامەد و دەوروبەری، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و موعتەزید لەمانگی زیحەجە/ دێسامبەر لەگەڵ کوڕەکەی باوکی محەممەد عەلی موکتەفی و سوپاکەی هاورێیان ( بۆ سەرکوت کردنی کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخ) بەرەو ئامەد بەرێکەوت و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و لەوێوە خۆی گەیاندە ئامەد و تا رەبیع الاوەلی ٢٨٦/ئاوریلی ٨٩٩ گەمارۆی خستە سەر شارەکە و قەڵاکوتەکانی جێگیر کرد. محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عیسا بۆ خۆی و هاوەڵانی و شارۆمەندان داوای ئەمانی کرد. موعتەزید ئەمانی پێبەخشین. محەممەد کوڕی ئەحمەد لەشارەکە هاتەدەر و تەسلیم بەموعتەزیدی کرد. موعتەزید ڕێزی گرت و دیاری پێبەخشی و دیواری شارەکەی داڕماند. دواتر ئاگادار بوویەوە کە محەممەد کوڕی شێخ مەبەستی هەڵاتنی هەیە. بەم شێوەیە موعتەزید خۆی وبنەماڵەکەی دەستگیر کرد.

لەم ساڵەدا هارون کوڕی خەمارەویە پەیکی بۆ لای موعتەزید نارد تا داوای لێ بکات ئەوەی لەدەستی شام و میسر لەدەستی نوێنەرەکانی ئەودایە، تەسلیم بەو بکات و باجێکی چەسپاو وەربگرێت و قێنسرین بەموعتەزید بسپێرێت و ساڵانە چوارسەد و پەنجا هەزار دیناری بۆ بنێرێت. موعتەزید رازی بوو و لەئامەد گەڕایەوە و موکتەفی کوڕی لەجێگەی خۆی دانا و گەیشتە قێنسرین و لەهاوەڵانی هارونی سەندەوە. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٢٨٦/ ٨٩٩ زایینی ڕوویدا.

لەم ساڵەدا کوڕی ئەخشیدی ئێرانی لەگەڵ دانیشتوانی تەرسوس جەنگی ئەزمون کرد. خواوەند ئەم شارەی لەسەر دەستی ئەو گرت. ئەو لەوێوە ڕووی کردە

ئەسکەندەرییە.

محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی داودی هاشمی ڕێ ورەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی ئیسحاقی حەربی لەبەغداد کۆچی دوایی کرد. ئەو یەکێك لەحەدیس بێژە گەورەکان بوو.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی دەبری، هاوەڵی عەبدولڕەزاق کە لەعەبدولڕەزاق حەدیسی دەگێڕایەوە، لەسەنعا مرد.

لەم ساڵەدا باوکی عەباس محەممەد کوڕی یەزیدی ئەزدی یەمانی خوی، ناسراو بەموبەرید، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و شەشی کۆچی( ٨٩٩ زایینی )

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی باوکی ساج، پیاوێکی ناسراو بەباوکی موسافری بۆ بەغداد ڕەوانە کرد و چاکەخوازی و فەرمانبەری خۆی نیشاندا و بەڵێنیدا چیتر یاخیگەری و شۆڕش نەکاتە پیشە. ئەو بەم نێردراوەدا چەندین دیاری و خەلاّتی نارد.

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی لەیس، لەنەیشابورەوە پێشکەشی بۆ موعتەزید نارد کەبەهاکەی چوار هەزار درهەم بوو.

## سەرەتای دەرکەوتنی قەرەمتییەکان لەبەحرەین

لەم ساڵەدا پیاوێك لەقەرەمتییەکان لەبەحرەین دەرکەوت کە بەباوکی سەعیدی جەنابی ناویان دەبرد. دەستەیەك لەعەرەبەکان و قەرەمتییەکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو کوشتاری دانیشتوانی گوندەکانی دەوروبەری کرد و پێگەی بەرز بوویەوە. دواتر ڕووی کردە ڕێگەی قەتیف و دانیشتوانەکەی کوشتار کرد. وای نیشاندا مەبەستی بەسرەی لەسەردایە. ئەحمەد کوڕی یەحیای واسقی، کارگوزاری بەسرە، ئەم هەواڵەی بۆ موعتەزید نووسی. موعتەزید فەرمانی پێدا بەدەوری بەسرەدا دیوارێك بکێشێت. بڕی تێچوونی ئەم کارە چواردە هەزار دینار بوو.

سەرەتای دەرکەوتنی قەرەمتییەکان لەکەنارەکانی بەحرەین بەم شێوەیە بوو: پیاوێك ناسراو بەیەحیا کوڕی مەهدی ڕووی کردە قەتیف و ڕۆشتە لای پیاوێك لەموالی زیادییەکان بەناوی عەلی کوڕی موعلی کوڕی حەمدان. ئەو لەشیعەگەریدا زێدەڕۆیی دەکرد. یەحیا وای نیشاندا کەنێردراوی مەهدی ( پێشەوای دوانزەی شیعەکان)ە. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٢٨١/ ٨٩٤ زایینی ڕوویدا.

ئەو بەعەلی وت مەهدی بەزووی خۆی نیشانی هەموو شیعەکانی سەرزەوی دەدات و پێشنیاری شوێنکەوتنی خۆی دەکات. عەلی کوڕی موعلی کەسی بۆ لای

هەموو شیعەکانی قەتیف نارد و هەموویانی کۆکردەوە و نامەیەکی لەمەهدی بۆ خوێندنەوە. ئەوان رازی بوون بەوەی هەرکات مەهدی خۆی ئاشکرا بکات، لەگەڵ ئەو شۆڕش دەست پێبکەن. عەلی کوڕی موعلی ئەم پەیامەی بۆ گوندەکانی دیکەی بەحرەین نارد و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە.

یەکێك لەو کەسانەی بەم بانگەوازە رازی بوو، باوکی سەعیدی جەنابی بوو. ئەو خواردەمەنی بەخەڵکان دەفرۆشت. یەحیا کوڕی مەهدی ماوەیەك خۆی شاردەوە و دواتر گەڕایەوە و نامەیەکی هێنابوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد نامەی مەهدی بۆ شیعەکانە. لەم نامەدا نووسرابوو: نێردراوی من، یەحیا، منی لەپەلە کردنی ئێوە بۆ دەرکەوتنی خۆم ئاگادار کردەوە،، لەبەر ئەمە دەبێت هەرکام لەئێوە شەش دینار و دوو لەسەر سێی دینارێکی پێ بدات. ئەوان ئەم پارەیان بەیەحیادا.

یەحیا ماوەیەکی دیکە خۆی شاردەوە و دوای گەڕانەوە نامەیەکی لەگەڵ خۆی هێنا کەتیایدا نووسرابوو، پێنج یەکی سامانەکەی خۆتان تەسلیم بەیەحیا بکەن. ئەوان پێنج یەکی سامانی خۆیان بەیەحیادا. یەحیا لەناو هۆزەکانی قەیس دەسوڕایەوە و نامەکانی نیشان دەدان و بانگەشەی ئەوەی دەکرد نامەی مەهدی. لەم نامەدا هاتبوو هەموویان ئامادە بن چوونکە ئەو بەزوویی دەردەکەوێت.

پیاوێك لەقەرەمتییەکان بەناوی ئیبراهیمی سائیغ دەڵێت کەلای باوکی سەعیدی جەنابی بوو. لەم کاتەدا یەحیا هات و لەگەڵ باوکی سەعید خواردنیان خوارد. کاتێك دەستیان لەخواردن هەڵگرت، باوکی سەعید لەماڵەکە ڕۆشتەدەر و بەژنەکەی وت بڕواتە لای یەحیا و ئەگەر یەحیا مەبەستی چێژوەرگرتنی کرد، خۆی بەدەستەوە بدات. فەرمانڕەوا لەم کارە ئاگادار بوویەوە. ئەو یەحیای گرت و ئەشکەنجەی کرد و مووی سەر و ڕیشی تاشی. باوکی سەعیدی جەنابی بۆ جەنابا هەڵات و یەحیا کوڕی مەهدی رووی کردە مناڵەکانی کەلاب و عوقەیل و خورەیس. ئەوان لەدەوری ئەو و باوکی سەعید کۆبوونەوە. بەم شێوەیە پێگەی باوکی سەعید بەرز بوویەوە و دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موعتەزید دوای سەرکەوتنی لەئامەد، ڕووی کردە ڕەققە – ئاماژەمان پێدا– و مناڵەکەی خۆی عەلی موکتەفی وەك فەرمانڕەوای قینسرین ودەشتەکان و جەزیرە راسپارد. دەبیرەکەی ئەو مەسیحی بەناوی حسین کوڕی عەمرۆ (تازە موسوڵمان) چاودێری دارایی ئەوی دەکرد. خولیەع لەم بارەوە ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| حسين بن عمرو القرآن | يصنع فى العرب ما يصنع |
| يقوم لهيبته المسلمون | صفوفا لفرد اذا يطلع |
| فان قيل قد اقبل الجاثليق | تحفى له و مشى يظلع |

واتاکەی: حسەین کوڕی عەمرۆ، دوژمنی قورئان، لەناو عەرەبەکان هەرچی بخوازێت، دەیکات. موسوڵمانان بۆ ڕێز گرتن لەو هەڵدەستنە سەرپێ و بۆ یەك کەس (کەئەو بێت) لەکاتی دەرکەوتنی، بەریز دەوەستن. ئەگەر پێی بوترێت جاسلیق، (گەورە ڕۆحانی مەسیحییەکان) هاتووە، پێپەتی و بەشەلەشەل بۆ پێشوازی دەڕوات.

لەم ساڵەدا کوڕی ئەخشید فەرمانڕەوای تەرسوس کۆچی دوایی کرد و پێش مردن، باوکی سابتی وەك جێگری خۆی دانا.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەعەرەبەکانی مناڵەکانی شەیبان، بەرەو ئەنبار بەرێکەوتن و گوندەکانیان تالأن کرد و هەرکەسیان گرت، کوشتیان و چوارپێکانیان فڕاند. ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی کەمشجور فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە بۆ ڕووبەڕووی بوونەوەی ئەوان بەرێکەوت بەلأم نەیتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆی ڕابگرێت و موعتەزیدی ئاگاداری کردەوە. موعتەزید سوپایەکی بۆ هاوکاری ئەو نارد. ئەم سوپایە ڕووبەڕووی شۆڕشگێران بوونەوە. بەلأم عەرەبەکان شکستیان پێهێنان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و زۆرینەی ئەوان لەئاودا نغرۆ بوون. سوپاکە بلأوەی لێکرد و بارودۆخ بۆ خراپەکاری عەرەبەکان لەو ناوچەیە

تەخت بوو.

موعتەزید لەم شکستە ئاگادار بوویەوە و سوپایەکی دیکەی ڕەوانە کرد. عەرەبەکان ڕێگەی عەین تەمەریان گرتەبەر ولەوێ خراپەکارییان کردە پیشە. ئەم پێشهاتە لەشەعبان و ڕەمەزان/ ئۆگۆست و سێپتامبەر روویدا. سوپایەکی دیکە بەرو عەین تەمەر بەرێکەوت. عەرەبەکان لەرێگەی ساراوە بەرەو کەنارەکانی شام ڕۆشتن. سوپاکەی موعتەزید بێ ئەوەی عەرەبەکان ببینن، بۆ بەغداد گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا موعتەزید، راغیب، موالی موەفەقی لەڕەققەوە بۆ تەرسوس بانگ کرد و خستیە زیندان و دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت. راغیب لەیەکەم رۆژەکانی زینداندا مرد. ئەم پێشهاتە لەمانگی شەعبان، ئۆگۆست روویدا. کۆیلەی راغیب/ بەکنونیان گرت و دەستیان بەسەر سامانەکەی لەتەرسوسدا گرت.

لەم ساڵەدا موعتەزید دیوانی مەشرقی بەمحەممەد کوڕی داود کوڕی جەراح سپارد و ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی فوراتی لابرد و عەلی کوڕی عیسا کوڕی داود کوڕی جەراحی وەك دیوانی مەغریب دانا.

لەم ساڵەدا باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی ئیبراهیمی ئەنماتی، ناسراو بەمورەبەع، هاوڕێی یەحیا کوڕی موعینی حەدیس زان و محەممەد کوڕی یونسی کەریمی بەسری، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و حەوتی کۆچی( ٩٠٠ زایینی )

کوژرانی باوکی سابت فەرمانڕەوای تەرسوس و هاتنە سەرکاری کوڕی ئەعرابی

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان کۆبوونەوە و لەرەبیع الاخر/ ئاوریل سوپایان ڕازاندەوە و خۆیان گەیاندە دەروازەی قەلەمیەی تەرسوس. باوکی سابت، فەرمانڕەوای تەرسوس، کەکوڕی ئەخشید لەسەرەمەرگ ئەوی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردبوو، هێزی کۆکردەوە و تا ڕەجان شوێن ڕۆمییەکان کەوت بەڵام لەم جەنگەدا لەگەڵ سوپاکەی گرفتار بوو. کوڕی کەلوب کە لەدەرب ئەلسەلام سەرقاڵی جەنگ بوو، کاتێك گەڕایەوە، پیر و سنوردارەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی ڕاوێژی بکەن و فەرمانڕەوایەك هەڵبژێرن. ئەوان لەسەر فەرمانڕەوایەتی کوڕی ئەعرابی ڕێککەوتن و جڵەوی کارەکانی خۆیان بەو سپارد. ئەم پێشهاتە لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە ڕوویدا.

## سەرکەوتنی موعتەزید بەسەر وەسیف و هاوەڵانی

لەم ساڵەدا وەسیف، خزمەتکاری محەممەد کوڕی باوکی ساج، لەبەرزەعە بۆ مەڵتییە، سنووری سەروەری خۆی هەڵات. ئەو نامەیەکی بۆ موعتەزید نووسی و داوای لێکرد سنوورەکان بەو بسپێرێت. موعتەزید نوێنەر و نامەبەرەکەی ئەوی گرت و لەهۆکاری جیابوونەوەی وەسیف لەسەروەرەکەی پرسیاری کرد. گیراوەکان ئاشکرایان کرد کەوەسیف لەگەڵ محەممەد کوڕی باوکی ساج پلانیان داناوە کەهەرکات وەسیف فەرمانڕەوایەتی سنورەکانی لەلایەن خەلیفەوە پێ سپێردرا، گەورەکەی بێت و فەرمانڕەوایەتی بگرێتەدەست و دواتر مەبەستی دیاری موزێر بکەن و دەستی بەسەردا بگرن.

موعتەزید بۆ جەنگی وەسیف بەرێکەوت و لەعەین سەودا ئوردووی لێدا. ویستی لەرێگەی مەسیسەوە هێرش بکات بەڵام سیخوڕەکان ئاگاداریان کردەوە

کەوەسیف بەرەو عەین زەربە دەڕوات. ئەم لەشارەزایان سەبارەت بەم ڕێگەیە پرسیاری کرد و بەدوای نزیکترین ڕێگە بۆ گەیشتن بەوەسیف گەڕا. دەستەیەك ئەویان بردە لای وەسیف. دەستەیەك لەسەربازەکانی موعتەزید لەپێشەوە دەڕۆشتن. ئەوان ڕووبەڕووی وەسیف بوونەوە و سەرئەنجام ئەسیریان کرد و بردیان لای موعتەزید. موعتەزید وەسیفی زیندانی کرد و فەرمانیدا لەناو هاوەڵانی وەسیف بانگی ئەمان بەرز بکەنەوە. فەرمانی بەسوپاکەی خۆیدا ئەوەی تاڵانییان کردووە، بیگەڕێننەوە. سوپا تاڵانییەکانیان گەڕاندەوە.

ئەم ڕوداوە لەحەقدەی زیقەعدە/ چواردەی نۆڤەمبەر ڕوویدا. موعتەزید دوای کۆتایی هاتنی ئەم جەنگە، ڕێگەی مەسیسەی گرتەبەر و گەورەکانی تەرسوسی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد و هەموویانی گرت چوونکە نامەیان بۆ وەسیف نووسیبوو. موعتەزید فەرمانیدا هەموو کەشتییە جەنگییەکانی تەرسوس و کەل و پەلەکانیان بسووتێنن. لەناو ئەم کەشتییانەدا پەنجا کەشتی باستانی دەبینرا کەخەرجییەکانی لەخەمڵاندن نایەت و چیتر نەدەکرا هاوشێوەی ئەوکەشتییانە دروست بکرێتەوە. ئەمە زیانی زۆری لەموسوڵمانان‌دا و لاوازی دروست کرد (چوونکە دەکرا وەك تاڵانی، تاڵانی بکەن). موعتەزید بەرۆمییەکانی وت: هەنووکە وەرنەدەریا و شەڕ دەستپێبکەن (بۆ گاڵتە پێکردن). سوتاندنی ئەم کەشتییانە لەسەر پێشنیاری بەندەی بازمار، دەمیانە، ئەنجامدرا چوونکە ڕقی تەرسوسییەکانی لەدڵدا بوو. موعتەزید، حەسن کوڕی عەلی کورەی بۆ فەرمانڕەوایەتی سنوورەکان دەستنیشان کرد و دواتر بەرەو ئەنتاکییە و حەلەب بەڕێکەوت و بۆ بەغداد گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا کچی خەمارەویە، هاوسەری موعتەزید، مرد.

## چۆنیەتی کاری قەرەمتییەکان و شکستی عەباسی غەنەوی لەوان

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە، پێگەی قەرەمتییەکان لەبەحرەین بەرز بوویەوە و هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی هیجر و دەستەیەك لەوان خۆیان لەبەسرە نزیك کردەوە. ئەحمەدی واسقی نامەیەکی نووسی و داوای هاوکاری کرد. کەشتییە جەنگییەکان بۆ هاوکاری کردنی ئەو ڕەوانە کران. سێسەد سوار لەناو کەشتییەکاندا دەبینرا. موعتەزید پیاوێکی وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کرد و عەباس کوڕی عەمرۆی غەنەوی لەسەرزەمینەکانی فارس دوور کردەوە و یەمامە و بەحرەینی بەو سپارد و فەرمانی پێدا جەنگ لەگەڵ قەرەمتییەکان دەست پێبکات و نزیکەی دوو هەزار سەربازی خستە ژێر فەرمانی ئەو. کوڕی عەباس بەرەو بەسرە بەرێکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەخۆبەخش و سەرباز و خزمەتکارەکان پەیوەستی بوون.

عەباس لەوێوە بۆ جەنگی سەعیدی جەنابی بەرێکەوت و شەوانە خۆی پێگەیاند. لەنێوان دوو سوپا ئاگری جەنگ هەڵگیرسا و تاریکی شەو دوو سوپاکەی لەیەك جیا کردەوە. کاتێك شەو، باڵی تاریکی بەسەر ناوچەکەدا کێشا، عەرەبەکانی مناڵەکانی زەببە، کەسێسەد کەس دەبوون، لەعەباس جیابوونەوە و ڕێگەی بەسرەیان گرتەبەر. خۆبەخشەکانی بەسرە بەدوای ئەواندا بەرێکەوتن. بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر عەباس جەنگی دەستپێکرد و هەرکام لەسوپا سەرسەختانە بەرگری دەکرد. لەم کاتەدا نەجاح، بەندەی ئەحمەد کوڕی عیسا کوڕی شێخ لەگەڵ سەد سوار لەباڵی چەپی سوپاکەی عەباسەوە هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی سوپاکەی باوکی سەعید و لەناو ئەواندا پێشڕەوی کرد بەڵام تا دوایین کەسیان کوژران. دواتر جەنابی و هاوەڵانی هێرشیان کردە سەر عەباس و شکستیان پێهێنا. عەباس ئەسیر کرا و ئوردووگاکەی تاڵان کرا. بەیانی ئەو ڕۆژە جەنابی دیلەکانی هێنا و هەموویانی سەربڕی و جەستەی بێ گیانی ئەوانی سوتاند. ئەم جەنگە لەکۆتایی شەعبان/ ئۆگۆست ڕوویدا.

جەنابی دوای ئەم جەنگە رووی کردە هەجەر و ئەمانی بەدانیشتوانەکەی بەخشی. دەستەیەك لەهەڵاتوان کەژمارەیان کەم بوو بێ هیچ توێشوێك رێگەی بەسرەیان گرتەبەر. نزیکەی چوارسەد کەس لەخەڵکانی بەسرە سوار لەسەر وشتر بەخواردەمەنییەوە بۆ پێشوازی هەڵاتووان هاتن بەڵام منالەکانی ئەسەد هێرشیان کردنەسەر و وشتر و بارەکانیان لەخەڵکانی بەسرە سەند و هەرکەس پریشکی جەنگەکەی بەرنەکەوتبوو، کوژرا. بەم شێوەیە خەڵکانی بەسرە ترسان و دانیشتوانەکەی مەبەستی بەجێهیشتنی شارەکەیان کرد بەڵام واسقی رێگەی رۆشتنی لێگرتن.

عەباس چەند رۆژێك لای جەنابی بوو تا ئەوەی رزگاری کرد و پێی وت: برۆ و ئەوەی بینیوتە، هاورێکەتی (مەبەست خەلیفەیە) لێ ئاگادار بکەرەوە. ئەوی سوار وشترێك کرد و ڕەوانەی کرد. عەباس گەیشتە یەکێك لەکەنارەکان و لەرێگەی ئاوەوە خۆی گەیاندە ئوبولە. لەوێوە رێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەرەمەزان/ ئۆگۆست گەشتە ئەوێ و خۆی گەیاندە بارەگای موعتەزید. موعتەزید میوانداری کرد و خەڵاتی پێ بەخشی.

بیستوومە عوبەیداللە کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر وتوویەتی: شتە سەرسوڕهێنەرەکانی دنیا سێ شتە: سوپاکەی عەباس بەتەواوی ئەسیر دەکرێت و تەنیا عەباس رزگاری دەبێت و هەموو سوپاکەی دەکوژرێن، سوپاکەی عەمرۆ کوڕی سەفار کەتەنیا عەمرۆ ئەسیر دەکرێت و هیچ زیانێك بەسوپاکەی ناگات و من لەماڵەوە دادەنیشم و کوڕەکەم باوکی عەباس فەرماندەیی دوو پردەکەی بەغداد دەگرێتە دەست.

کاتێك باوکی سەعید، عەباسی رزگار کرد، نامەیەکی سەر بەمۆری پێدا و وتی: ئەم نامە بەدەستی موعتەزید بگەیێنە چوونکە نهێنییەکانم لەم نامەدا نووسیوە. کاتێك عەباس هاتە لای موعتەزید، موعتەزید سەرکۆنەی کرد. عەباس نامەکەی باوکی سەعیدی پێدا. موعتەزید وتی: سوێند بەخوا هیچ شتێکی تیا نەنوسراوە. ئەو ویستوویەتی بەم نامەیە ئاگاداری بەمن بدات و من تۆم لەگەڵ دەستەیەکی فراوان بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و هەنووکە تەنیا دەگەڕێیتەوە بۆ لای من.. کاتێك

نامەکەی کردەوە، بینی هیچی تیا نەنوسراوە. (گومانەکەی موعتەزید پێش کردنەوەی نامەکە بوو)

لەزیقەعدە/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە، بەندەی تائی، لەکەنارەکانی میسان و شوێنەکانی دیکە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕووبەڕووی قەرمەتییەکان بوویەوە و ژمارەیەکی فراوانی لەوان کوشت بەڵام لەترسی ئەوەی شارەکە وێران نەبێت، دەستی لەکوشتنی ئەوان هەڵگرت چوونکە ئەوان وەرزێر بوون. شوێنپێی سەرۆکەکانی ئەوانی هەڵگرت و هەرکەسێکی گرت، کوشتی.

## گرفتاری عەمرۆ کوڕی سەفار و زاڵبوونی ئیسماعیل لەخوراسان

لەرەبیع الاوەل/ مارسی ئەم ساڵە، عەمرۆ کوڕی لەیسی سەفار ئەسیر کرا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: عەمرۆ سەری رافیع کوڕی هەرسیمەی بۆ موعتەزید نارد و داوای لێکرد فەرمانڕەوایەتی ماوەرا ئەلنەهری پێ ببەخشێت. موعتەزید ئاڵای فەرمانڕەوایەتی ماوەرائەلنەهری بۆ ڕەوانە کرد. عەمرۆ لەم کاتەدا لەنەیشابور بوو. ئەو محەممەد کوڕی بەشیری بۆ جەنگی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی ساسانی، ئەمیری ماوەرا ئەلنەهری ڕەوانە کرد. محەممەد کوڕی بەشیر، جێگر و پەردەدار و باشترین و نزیکترین هاوڕێی عەمرۆ بوو و پێگەی لەهەموان بەرزتر بوو. ئیسماعیل لەجەیحون تێپەڕی و جەنگی لەگەڵ دوژمن کرد و شکستی پێهێنان و محەممەد کوڕی بەشیر و شەش هەزار سەربازی کوشت و بۆ بوخارا گەڕایەوە. عەمرۆ بۆ جەنگی ئیسماعیل سوپای تەیار کرد. هاوەڵانی پێشنیاریان کرد گیانی خۆی نەخاتە مەترسییەوە و سوپایەك ڕەوانە بکات بەڵام عەمرۆ رازی نەبوو و لەنەیشابوورەوە ڕێگەی بەڵخی گرتەبەر. ئیسماعیل پەیامی بۆ نارد: تۆ فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینێکی پان و بەرین دەکەیت، بەوەی لەژێر دەستایە، شادمان بە و من لەم سنورە بەجێبێڵە. من پارێزەری سنور و ڕووبەڕووی دوژمنم، کەواتە بەجێم بێڵە. عەمرۆ رازی نەبوو. بەعەمرۆیان وت ڕووباری بەڵخ دژوارە. لەوەڵامدا وتی: ئەگەر بەو شێوە بێت کەبۆ پەڕینەوە لەو ڕووبارە، سامان و دارایی خۆم بۆ هەڵبەستنی پرد، خەرج بکەم، ئەو کارە دەکەم.

ئیسماعیل بۆ جەنگی عەمرۆ بەرێکەوت و بەگوزەر کردن لەرووبارەکە خۆی گەیاندە بەشی رۆژهەلات. ئیسماعیل لەگەلْ سوپا فراوانەکەی کەنارەکانی گرت و عەمرۆ ناکاوگیر کرا و پەشیمان بوویەوە و داوای پشت گویْ خستنی جەنگی کرد بەلام ئیسماعیل رازی نەبوو و لەسەر جەنگ پێداگری کرد. هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر جەنگەکەدا تێنەپەریبوو کەعەمرۆ شکستی خوارد و هەلات و پەنای بۆ دارستانێکی کەنار رێگە برد. کەسانی دەوروبەری رێگەیەکی نزیکیان نیشاندا بەلام داوای لەهەموان کرد بەرێگەیەکی ئاشکرادا برۆن. ئەو لەگەلْ ژمارەیەکی کەم بەرێکەوت بەلام ئەسپەکەی کەوتە زۆنکاوێك و رێگەی چارەی لیْ برا. کەسانی دەوروبەری چوونکە لەبیری رزگار کردنی خۆیان بوون، رۆشتن و ئاوڕیان لێنەدایەوە. هاوەلانی ئیسماعیل گەیشتن و ئەسیریان کرد. ئیسماعیل ئەوی بۆ سەمەرقەند نارد.

کاتێك موعتەزید ئاگادار بوویەوە، سەرکۆنەی عەمرۆ و وەسفی ئیسماعیلی کرد. ئیسماعیل دوو رێگەی خستە بەردەم عەمرۆ: یا لای ئەو بمێنێتەوە یا رەوانەی بارەگای موعتەزیدی بکات.[٢١] عەمرۆ رۆشتن بۆی لای موعتەزیدی هەلْبژارد. ئیسماعیل ئەوی رەوانە کرد و ئەو لەسالْی ٩٠١/٢٨٨ زایینی گەیشتە بەغداد. کاتێك عەمرۆ هاتە ناو بەغداد، ئەویان سوار وشترێك کرد و بردیانە ناوشار و دواتر زیندانییان کرد. ئەو لەزیندان مایەوە تا ئەوەی لەسالْی ٩٠٢/٢٨٩ زایینی بەو جۆرەی ئاماژەی پێدەدەین، کوژرا.

موعتەزید خەلاتی بۆ ئیسماعیل نارد و هەموو سنورەکانی عەمرۆی بەو سپارد. موعتەزید هەروەها خەلاتی بەنوێنەرەکەی ئەو لەدەرباری بەغداد بەخشی. بەم شێوەیە ئیسماعیل فەرمانڕەوایەتی خوراسانی گرتەدەست.

عەمرۆ یەکچاو، رەشو شارەزای بەرێوەبردنی ولات بوو. بەیاران و سەرکردەکانی خۆی مۆلەتی نەدەدا لەهیچ کەسێك بدەن مەگەر بەفەرمانی خۆی،

---

[٢١]- لەمێژووە برواپێکراوەکاندا هاتووە ئیسماعیل بۆ ئازاد کردنی عەمرۆ داوای بیست بار هەزار هەزار درهەمی کرد و سەرئەنجام بەنیوەی ئەم برە پارەیە رازی بوو و لەبەر ئەوەی کەسەکانی عەمرۆ ئەم برە پارەیان نەنارد، عەمرۆ لەزیندان مایەوە و ئیسماعیل چوونکە لەگەلْ خەلیفە پلانی لەناو بردنی عەمرۆیان دارشتبوو، لەسەمەرقەند ئەوی تەسلیم بەنێردراوانی خەلیفە کرد. عەباس ئیقبال، سیاسەتنامە، ل ٢٠

تەنانەت جێگرەکەی یا پەردەدارەکەی مۆڵەتی ئەشکەنجەدانی کەسیان نەبوو. ئەو کۆیلەی لەمناڵیدا دەکڕی و پەروەردەی دەکردن و دواتر بەسەرکردەکانی دەبەخشی و بەنهێنی ڕۆژانەیەکی باشی پێدەدان تا ئەو لەکار و جموجۆڵی سەرکردەکان ئاگادار بکەنەوە و بەم شێوەیە هیچ کارێکی سەرکردەکان لای ئەو شاراوە نەبوو و کەس نەیدەزانی عەمرۆ چۆن لەکار و جموجۆڵی ئەوان ئاگادار دەبێتەوە.

دەگێڕنەوە عەمرۆ کارگوزارێکی لەفارس بوو بەناوی باوکی حوسێن. ڕۆژێك عەمرۆ لێی تووڕە بوو و ناچاری کرد زەوییەکانی خۆی بفرۆشێت و بەهاکەی بدات. دواتر داوای سەد هەزار درهەمی دیکەی لێکرد و ئاگاداری کردەوە ئەگەر لەماوەی سێ ڕۆژدا ئەو بڕە پارە نەدات، دەیکوژێت. باوکی حوسێن نەیتوانی ئەوبڕە پارەیە ئامادە بکات، کەسێکی بۆ لای باوکی سەعید، دەبیری سەفار) نارد و داوای لێکرد سەردانی بکات. مۆڵەتی سەردانی پێدرا. باوکی حوسێن پێی وت هەنووکە دەستی تەنگە و داوای لێکرد ببێتە دەستەبەری بۆ ئەوەی لەزیندان بێتەدەر و بۆ کۆکردنەوەی ئەم بڕە پارەیە هەوڵ بدات چوونکە ئەگەر نەیدات دەکوژرێت. باوکی سەعید ئەو کارەی کرد و ئەوی لەزیندان هێنایەدەر. باوکی حوسێن نەیتوانی پارەکە کۆبکاتەوە و بەناچاری بۆ لای باوکی سەعید گەڕایەوە و بەمەرگی خۆی ڕازی بوو. عەمرۆ ئاگادار بوویەوە. وتی: سوێند بەخوا نازانم سەرم لەکام یەك لەم دوانە سور بمێنێت، لەباوکی سەعید کەخۆی کردە دەستەبەری سەد هەزار درهەم یا باوکی حوسێن کەگەڕایەوە و دەیزانی سەرئەنجامی ژیانی مەرگە؟ فەرمانیدا باوکی حوسێن ئازاد و پێگەکەی جارانی پێ ببەخشنەوە.

دەگێڕنەوە عەمرۆ هەمیشە هەمانەی زۆری لەگەڵ سوپاکەیدا هەڵدەگرت و کەس هۆکاری ئەم کارەی نەدەزانی. یەکێك لەساڵەکان بڕیاریدا دەستەیەك یاخی لەناوببات. ملی ڕێگەیەکی گرتەبەر کەشۆڕشییەکان بیریان لێ نەدەکردەوە. لەوێ زۆنکاوێکی مەترسیدار دەبینرا. عەمرۆ فەرمانیدا هەمانەکان لەزیخ و لم پڕ بکەن و لای یەکتر بیانچنن. و ڕێگەی گوزەری پێ پڕ بکەنەووە. کاتێك هەمانەکانیان لەسەر ڕێگە پەڕینەوە دانا و ڕێگەکەیان ئامادە کرد، فەرمانیدا سوپاکەی بپەڕێتەوە.

سەربازەکان پەڕیینەوە و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر دوژمن و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و بەمەبەستەکەی خۆیان گەیشتن.

دەگێڕنەوە محەممەد کوڕی بەشیر یەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی عەمرۆ بوو. عەمرۆ لەزۆر لەکارە گرنگەکان ئەوی دەکردە نوێنەری خۆی. ڕۆژێك عەمرۆ ڕۆشتە لای و چەندین گوناحی ئەوی هەژمارد. محەممەد سوێندی بەخوا و تەلاق و بەندایەتی خۆی خوارد جگە لەپەنجا کیسە زێر هیچی دیکەی نییە و ئەویش تەسلیم بەگەنجینە دەکات. داوای لەعەمرۆ کرد ئاماژە بەگوناحێك نەکات کەئاگایی لێ نییە. عەمرۆ وتی: تۆ پیاوێکی زیرەك و بیرمەندیت، سامانەکەت بەگەنجینە بسپێرە. ئەویش سامانەکەی خۆی بەگەنجینە سپارد و عەمرۆ لێی ڕازی بوو. چەند قێزەونە و ناپەسەندە تەماح لەسامانی کەسێك کەژیانی خۆی بۆ تۆ تەرخان کردووە.

## کوژرانی محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی زەیدی عەلەوی، فەرمانڕەوای تەبەرستان و دیلمان کوژرا.

هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو کاتێك هەواڵی گرفتاری بوونی عەمرۆ کوڕی لەیسی سەفاری بیست، لەتەبەرستان بەرەو خوراسان بەڕێکەوت. گومانی دەکرد ئیسماعیلی سامانی لەسنوری خۆی (ماوەرا ئەلنەهر) گوزەر ناکات و ڕێگەی خوراسان ناگرێتەبەر و ئەو بۆ دەست گرتن بەسەر خوراسان هیچ بەرگریکارێکی نابێت.

کاتێك محەممەد گەیشتە جورجان، ئیسماعیل کەفەرمانڕەوایەتی خوراسانی دەکرد، پەیامی بۆ نارد: لەسنوری خۆت بمێنەرەوە و سنوری من مەبەزێنە و ڕێگەی خوراسان مەگرە بەر. ئیسماعیل جورجانی بەوسپارد بەڵام محەممەد ڕازی نەبوو. ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد، محەممەد کوڕی هارون کە لەڕۆژگاری رافیع کوڕی هەرسیمە جێگری ئەو لەخوراسان بوو، بۆ جەنگی محەممەد ڕەوانە کرد. محەممەد کوڕی هارون ژمارەیەکی زۆر لەسوارە و پیادەکانی کۆکردەوە و هێرشی

کردە سەر محەممەد کوڕی زەید و لەکەنار دەروازەی جورجان دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ئاگری شەڕێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند. سەرەتا محەممەد کوڕی هارون شکستی خوارد بەڵام گەڕایەوە. گەڕانەوەی ئەو لەکاتێکدا بوو هاوەڵانی محەممەد کوڕی زەید بۆ کۆکردنەوەی تاڵانی بڵاو ببوونەوە. کاتێك هاوەڵانی محەممەد کوڕی زەید، گەڕانەوەی محەممەد کوڕی هارونیان بینی، ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر و لەم ناوەدا ژمارەیەکی زۆریان کوژران و محەممەد کوڕی زەید بریندار بوو و کوڕەکەی زەید، ئەسیر کرا. محەممەد کوڕی هارون ئوردووگاکەی تاڵان کرد. محەممەد کوڕی زەید بەهۆی برینەکانی، مرد و لەکەنار دەروازەی جورجان بەخاك سپێردرا.

زەید کوڕی محەممەدیان بردە لای ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد. ئیسماعیل ڕێزی گرت و لەبوخارا جێگەی کردەوە و محەممەد کوڕی هارون ڕێگەی تەبەرستانی گرتەبەر.

محەممەد کوڕی زەید، پیاوێکی فرەزان، ئەدەب دان، عارف و چاکەکار بوو.

باوکی عومەری ئەستەر ئابادی دەڵێت: من بەسەرهاتی عەباسییەکانم بۆ محەممەد کوڕی زەید دەخوێندەوە. پێم وت: ئەوان نازناویان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد، ئایا نازناوەکان بۆ تۆ بخوێنمەوە یا نە؟ وتی: خۆت دەزانی، دەخوازی بیانخوێنە یا بەباشترین نازناو کەئەوان پەسەندیان دەکرد، ناویان ببە.

دەگێڕنەوە: دوو دوژمن داوەریان بردە لای یەکیان بەناوی معاویە و ئەوی دیکە عەلی. محەممەد وتی: داوەری کردن لەنێوان ئێوە ئاشکرایە، عەلی ڕاست دەکات. معاویە وتی: کەمێك چاوەڕوان بە چوونکە لەپشت ئەم دوو ناوە ڕاستییەك شارەوەیە. محەممەد وتی: چ ڕاستییەك؟ معاویە وتی: باوکی من لەشوێنکەوتە شیعەکانە و منی ناونا معاویە تا لەزیانی دوژمنانی عەلی ئاسوودە بم و باوکی عەلی لەدوژمنانی عەلی بوو بەڵام منداڵەکەی ناونا عەلی تا لەزیانی شوێنکەوتەکانی عەلی ئاسوودە بێت. محەممەد کوڕی زەید پێکەنی و بەڕاستی داوەری لەنێوان ئەواندا کرد. ڕێزی لەمعاویە گرت و لەخۆی نزیکی کردەوە.

دەگێڕنەوە: دەستەیەك لەزیان بەرکەوتووان و هەژارە شیعەکان داوای مۆڵەتی

سەردانیان کرد. محەممەد کوڕی زەید وتی: وەرنە ژوور چوونکە ئێمەیان ناوێت جگە لەو کەسانەی کەڕ وکوێر و تێکشکاون.

## فەرمانڕەوای باوکی عەباس لەسەقەلیە

ئیبراهیم کوڕی ئەمیر ئەحمەد، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، باوکی مالك ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی عەبدوللەی وەك کارگوزاری سەقەلییە دەستنیشان کرد بەڵام دوای ئەوەی بەناتەوانی بینی، کوڕەکەی خۆی باوکی عەباس کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەبی کردە فەرمانڕەوای ئەو دیارە. باوکی عەباس لەسەرەتای مانگی شەعبان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە گەیشتە ئەو دیارە و لەگەڵ سەد و بیست کەشتی و چل ناوی جەنگی، گەمارۆی خستە سەر تەرابلوس.

ئوردووگای موسوڵمانان لەبەلەرم لەم گەمارۆیە ئاگادار بووینەوە. موسوڵمانان کەلەم کاتەدا لەگەڵ دانیشتوانی جەرجەنت جەنگیان تاقی دەکردەوە بۆ بەلەرم گەڕانەوە و دەستەیەك لەپیرەکانی خۆیان بۆ لای باوکی عەباس نارد تا گوێڕایەڵی خۆیان بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشان بدەن و لەوەی مەبەستی گرتنی جەرجەنتیان کردووە، داوای بەخشین بکەن. دانیشتوانی جەرجەنت دەستەیەکیان بۆ لای باوکی عەباس نارد و سکاڵایان بەرز کردەوە کەخەڵکی بەلەرم خۆویستانە جەنگیان لەگەڵ ئەوان دەست پێکردووە و پیرەکانی خۆیان تەنیا بۆ فریودان، ڕەوانەی بارەگای ئەو کردووە. ئەم دەستەیە نەباوەڕیان بەسوێند هەیە نەپەیمان. ئەگەر باوکی عەباس خوازیاری دەرکەوتنی ڕاستی و ناراستی ئەم وتەیە، فلانەکەس و فیسارە کەس بانگ بکات. ئەگەر هاتنە بارەگاکەی، ڕاست دەکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانن و ئەگەر نەهاتن، ئاژاوە گێڕن.

باوکی عەباس کەسی بەدوای فلانە و فیسارەدا نارد و بۆ بارەگاکەی بانگی کردن بەڵام ئەوان بەهاتن ڕازی نەبوون و ناسازگاری خۆیان ئاشکرا کرد. باوکی عەباس پیرەکانی زیندانی کرد. خەڵکانی بەلەرم کۆبوونەوە و لەنیوەی شەعبان/ شانزەی ئۆگۆست هێرشیان کردە سەر باوکی عەباس. سەرۆکی ئەوان مەسعودی باجی و سەردەستەی سەرسەری و ئاژاوەگێڕەکان، ڕەکمویە بوو. سی کەشتی

هاورێیەتی ئەوانی دەکرد. تۆفانێك لەدەریادا هەڵیکرد و زۆربەی کەشتییەکانی تێکشکاند و ئەوەی مایەوە، بۆ بەلەرم گەڕایەوە. ئەو سوپایەی لەرێگەی وشکانییەوە بەرێکەوتبوو، خۆیان لەباوکی عەباس لەتەرابلوس نزیك کردەوە و جەنگێکی قورس دەستی پێکرد. ژمارەیەکی زۆر لەهەردوولا کوژران وسەرئەنجام لەیەك جیابوونەوە و لەبیست و دووی شەعبان/ بیست و سێی ئۆگۆست، دووبارە ئاگری جەنگیان خۆش کردەوە و ئەم جارە لەکاتی ئێواریێ خەڵکانی بەلەرم شکستیان خوارد. باوکی عەباس لەرێگەی دەریا و وشکانییەوە تا بەلەرم شوێنیان کەوت و ئەوان دووبارە لەدەی رەمەزان/ دەی سێپتامبەر لەبەیانی تا ئێواریێ، درێژەیان بەجەنگدا و دووبارە خەڵکانی بەلەرم شکستیان خوارد و تا ئێواریێ لێیان دەکوژرا.

باوکی عەباسی بۆ گەرەکەکانی شار کارگوزاری دیاری کرد و سامانی دانیشتوانی شارەکەی تالان و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان و ژنانی بەلەرم بۆ تەبەرمین هەڵاتن و رەکمویە و هاوشانەکانی ئەو لەجەنگ بۆ شارە مەسیحییەکان وەك قوستەنتەنییە هەڵاتن. باوکی عەباس دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و کاتێك هاتە ناو شارەکە، ئەمانی بەهەموان بەخشی و دەستەیەك لەسەرکردەکانی گرت و رەوانەی بارەگای باوکی لەئەفریقییە کرد.. دواتر باوکی عەباس روویکردە تەبەرمین و دارخورماکانی لەناو برد و رێگەی جەنگی گرتەبەر. دواتر روویکردە قەتانییە و گەمارۆی خستەسەر بەلام نەیتوانی بەمەبەستەکەی بگات و بۆ تەبەرمین گەڕایەوە و تا ساڵی ٩٠١/٢٨٨ زایینی لەو شارە مایەووە و دواتر سوپای بۆ جەنگ ئامادە کرد. رۆژگاری هاوکاری دەکرد. باوکی عەباس سەرلەنوێ کەشتییە جەنگییەکانی نۆژەن کردەوە و لەسەرەتای رەبیع الاوەل/ شەشی مارس پێشڕەوی دەستپێکردو لەدەمەنش ئورودوی لێدا و قەڵاکوتەکانی جێگیر کرد و چەند رۆژێك چاوەڕوان بوو. دواتر بۆ موسینی گەڕایەوە و لەگەڵ کەشتییە جەنگییەکان بۆ ریو گەڕایەوە. لەوێ ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکان کۆببوونەوە. باوکی عەباس لەکەنار دەروازەی شار جەنگی لەگەڵ ئەوان ئەزمون کرد و شکستی پێهێنان و لەمانگی رەجەب/ جولای، بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و ژمارەیەکی زۆر سیم و زێر

و زێوی وەك تالآنی کۆکردەوە و کەشتییەکانی خۆی لەئارد و کالآکانی دیکە لیپاولیپ کرد و دواتر بۆ مەسینی گەڕایەوە و دیوارەکەی رووخاند. لەوێ دەستی بەسەر ئەو کەشتییانەدا گرت کە لەقوستەنتەنییەوە بوون. دەستی بەسەر سێ کەشتییدا گرت و بۆ شارەکە گەڕایەوە و تا ساڵی ٩٠١/٢٨٩ زایینی مایەوە. لەم کاتەدا نامەیەکی لەباوکییەوە بەدەست گەیشت کەفەرمانی گەڕانەوەی بۆ ئەفریقییە تیا نووسرابوو. سوار لەسەر ئەسپ بەرەو ئەفریقییە غاریدا و لەپێنج مەنزڵ خۆی گەیاندە ئەفریقییە و سوپاکەی خستە ژێر فەرمانی دوو منالەکەی، باوکی موزەر و باوکی مەعد.

کاتێك گەیشتە ئەفریقییە، باوکی ئەوی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و خۆی بەمەبەستی جیهاد!؟ رێگەی سەقەلییەی گرتەبەر تا دوای جەنگ و جیهاد بەمەبەستی حەج بەرەو مەککە بڕوات. ئەم پێشهاتە لەرجەبی ٢٨٧/ جولای ٩٠٠ زایینی روویدا. ئێمە بەسەرهاتی ئەومان تا ساڵی ٨٧٤/٢٦١ زایینی باس کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا هۆزی تەی، ژمارەیەکی زۆر لەعەرەبەکانیان کۆکردەوە. ئەوان پەلاماری کاروانی حاجییەکانیاندا و لەمەعدەن هێرشیان کردنەسەر و هەینی، بیست و حەوتی زیحەججە/ بیست و چواری ژانوویە ئاگری جەنگیان لەگەڵ حاجییەکان خۆش کرد و سەرئەنجام عەرەبەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لەخوێنی خۆیاندا گەوزان. حاجییەکان قەرەبووی زیانەکانیان لێ سەندنەوە.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی ئەیوب کوڕی ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی خەتابی عەدەوی، لەرەبیعە، فەرمانڕەوای سەرزەمینی رەبیعە لەسەرزەمینەکانی جەزیرە کۆچی دوای کرد و عەبدوللە کوڕی هەیسەم کوڕی عەبدوللە کوڕی موعتەمەر جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا قەترالنەدی کچی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون، فەرمانڕەوای میسر و هاوسەری موعتەزید، مرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی داود، ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ حاجییەکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا موعتەزید، عیسا نەوشەری، فەرمانڕەوای ئیسفەهانی وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینەکانی فارس دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدا بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوێت.

لەم ساڵەدا فەهد کوڕی ئەحمەد کوڕی فەهدی ئەزدی موسڵی لەگەورەکان و عەلی کوڕی عەبدولعەزیزی بەغەوی کەهاوڕێی باوکی عوبەید قاسم کوڕی سەلام بوو، هەردووکیان مردن. عەلی کوڕی عەبدولعەزیز لەمەککە مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و هەشتی کۆچی

(٩٠١ زایینی) لەم ساڵەدا کۆلێرا لەئازەربایەجان بڵاو بوویەوە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن تا ئەو جێگەی چیتر کفن دەست نەدەکەوت و مردووەکانیان بێ کفن بەخاك دەسپارد یا لەسەر ڕێگەکان فڕیان دەدان.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی باوکی ساج ناسراو بەئەفشین لەئازەربایەجان بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە مرد. هاوەڵانی کۆبوونەوە و کوڕەکەی دیودادیان لەجێگەی ئەو هێنایە سەر تەخت. مامی دیوداد، یوسف، ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر و جیابوویەوە. یوسف هێرشی کردە سەر برازاکەی کە لەئوردووگاکەی باوکیدا بوو، بەڵام شکستی خوارد. دیوداد پێشنیاری مانەوەی بەمامەکەی کرد بەڵام یوسف ڕازی نەبوو و لەڕێگەی موسڵەوە بەرەو بەغداد کەوتەڕێ. ئەم پێشهاتە لەمانگی ڕەمەزان/ ئۆگۆست ڕوویدا.

لەسەفەر/ ژانویەی ئەم ساڵە تاهیر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کلەیس لەگەڵ سوپاکەی خۆی هێرشی کردە سەر فارس و کارگوزاری خەلیفەی لەو شارە دەرکرد. ئەمیر ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی ساسانی نامەیەکی بۆ تاهیر نووسی کەخەلیفە موعتەزید ئەو(ئیسماعیلی) وەك فەرمانڕەوای سەجستان دیاریکردووە و هەنووکە بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوتووە. کوڕی تاهیر دەستی لەفارس هەڵگرت (بۆجەنگی ئیسماعیل بەڕێکەوت.)

هەروەها لەم ساڵەدا موعتەزید، موالیەکەی خۆی، بەدری وەك فەرمانڕەوای فارس دەستنیشان کرد. کاتێك بیستی تاهیر دەستی بەسەر فارسدا گرتووە، فەرمانی پێدا بەرەو فارس بەڕێکەوێت و ئەو لەجومادی الاخرە/ مەی، لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر فارس. کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە، هاوەڵانی تاهیر هەڵاتن و بەدر ڕۆشتە ناو شارەکە و باجی کۆکردەوە و تاهیر بەرەو سەجستان گەڕایەوە چوونکە وەك ئاماژەمان پێدا، ئیسماعیلی سامانی نامەی بۆ نووسیبوو کەمەبەستی سەجستانی هەیە.

لەم ساڵەدا پیاوێکی عەلەوی دەستی بەسەر سەنعادا گرت. منداڵەکانی یەعفەر لەگەڵ دەستەیەکی گەورە ڕووبەڕووی بوونەوە و شکستیان پێهێنا. ئەو پیاوە عەلەوییە لەگەڵ پەنجا سوار هەڵات و منداڵەکانی یەعفەر کورەکەی ئەویان ئەسیر و ڕۆشتنە ناو سەنعا و بەناوی موعتەزید وتاریان خوێندەوە.

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی عەلی کورە، هاوڕێ و هاوەڵی خۆی، نزار کوڕی محەممەدی بۆ جەنگی هاوینە لەڕۆم نارد. ئەو ڕووبەڕووی ڕۆمییەکان بوویەوە و دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەئەسیرەکان گەڕایەوە. دواتر ڕۆمییەکان لەڕێگەی دەریا و وشکانییەوە هێرشیان کردە سەر کیسوم و زیاتر لەپانزە هەزار موسوڵمانیان ئەسیر کرد و گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا هاوەڵانی باوکی سەعیدی جەنابی، لەبەسرە نزیك بوونەوە. دانیشتوانی ئەم شارە ترسان و مەبەستی هەڵاتنیان کرد بەڵام فەرمانڕەوای شارەکە ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن.

لەزیحەججە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە وەسیف، خزمەتکاری کوڕی باوکی ساج کوژرا و جەستەی بێ گیانی ئەو لەبەغداد هەڵواسرا. دەستەیەك دەڵێن خۆی مردووە و کەس خوێنی نەڕشتووە.

هارون کوڕی محەممەد لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەرەبیع الاوەل/ مارسی ئەم ساڵە.عوبەیدالله کوڕی سلێمانی وەزیر مرد. مەرگی ئەو بۆ موعتەزید دژوار بوو. موعتەزید دوای ئەو کوڕەکەی باوکی حسین قاسم کوڕی عوبەیداللەی وەك وەزیر لەجێگەی باوکی دانا.

لەم ساڵەدا ئیبراهیمی حوڕی و بیشر کوڕی موسای ئەسەدی مردن.

لەم ساڵەدا سابت کوڕی قوڕە کوڕی سەنانی سابی، پزیشکی ناودار و موعاز کوڕی موسەننا مردن. مەرگی ئەوان لەمانگی سەفەر/ ژانویە ڕوویدا.

## ڕوداوەکانی ساڵی دووسەد و هەشتا و نۆی کۆچی ( ٩٠٢ زایینی )

## ئاماژەیەك بەهەواڵی قەرەمتییەکان لەشام

لەم ساڵەدا پیاوێك لەقەرەمتییەکان لەشام دەرکەوت و دەستەیەك لەعەرەبەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و ڕوویکردە دیمەشق. فەرمانڕەوای دیمەشق لەو کاتەدا توغج کوڕی جوف نوێنەری هارون کوڕی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون بوو. لەنێوان ئەم دوو سوپا چەندین جار جەنگ ڕوویدا.

سەرەتای دەرکەوتنی ئەم پیاوە قەرەمتییە بەم شێوە بوو کاتێك زەکرەوییە کوڕی مەهرەویە (ئێرانی) – کەبانگەشەی بۆ قەرەمتییەکان دەکرد– بینی سوپای موعتەزید بەردەوام قەرەمتییەکان بۆ دەوروبەری کوفە دوور دەخاتەوە و قەرەمتییەکان ئەو ناوچەیە وێران دەکەن، هەوڵیدا عەرەبەکانی دەوروبەری کوفە کەهۆزەکانی ئەسەد و تەی و کەسانی دیکە بوون، فریوبدات بەڵام کەسیان بەداواکانی ڕازی نەبوون. ئەو مناڵەکانی خۆی بۆ لای هۆزی کەلب کوڕی وەبرە نارد و ئەوان هاتنە ناو ئەو هۆزە و بانگەشەیان بۆ قەرەمتییەکان کرد. لەناو هۆزی کەلب کوڕی وەبرە تەنیا بنەماڵەی مناڵەکانی عولەیس کوڕی زەمزەم کوڕی عودەی کوڕی خەباب و موالییەکانی ئەوان وەڵامیان دانەوە و لەساڵی ٩٠٢/٢٨٩ زایینی لەدەوروبەری سەماوە بەیعەتیان بەمناڵەکەی زەکرەویە بەناوی یەحیا و نازناوی باوکی قاسم سپارد و ئەویان بەشێخ ناو برد. ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیە.

دەگێڕنەوە محەممەد کوڕی ئیسماعیل هیچ مناڵێکی بەناوی عەبدوللە نەبووە. ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد لەسەرزەمینی ئیسلام زیاتر لەسەد هەزار شوێنکەوتەی هەیە و ئەوەی کەوشترەکەی گوێرایەڵی فەرمانەکانی خواوەندە و ئەگەر لەسەر ڕێگەی وشترەکەی بڕۆن سەرکەوتن بەدەست دێنن. ئەو بازووی شکاوی خۆی نیشان دەدا و وەك مۆجیزەی خۆی باسی دەکرد. دەستەیەك

لەماڵەکانی ئەسبەغ دەوریان گرت و خۆیان بەفاتمی ناوبرد و شوێن ئایینەکەی ئەو کەوتن. شیبل کۆیلەی موعتەزید، لەرەسافەوە مەبەستی جەنگی ئەم دەستەی کرد بەڵام فریویاندا و خوێنیان ڕشت. ئەم دەستەیە مزگەوتی رەسافەیان سووتاند و هەموو گوندەکانی سەر ڕێگەیان تاڵان کرد تا گەیشتنە سنووری هارون کوڕی خەمارەویە کە لەژێر فەرمانی توغج کوڕی جوفدا بوو. لەوێ ژمارەیەکی زۆریان کوشت و تاڵانی فراوانیان کۆکردەوە. توغج ڕووبەڕوویان بوویەوە بەڵام چەندین جار شکستی خوارد.

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان لەعێراق

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان لەدەوروبەری کوفە بڵاو بوونەوە. موعتەزید، شیبل، کۆیلەی ئەحمەد کوڕی محەممەدی تائی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. شیبل سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ڕێبەرەکەی ئەوان بەناوی باوکی فوراسی ئەسیر و ڕەوانەی بارەگای موعتەزیدی کرد. موعتەزید ئەوی بانگ کردە بارەگاکەی و وتی: ئاگادارم بکەرەوە، ئایا گومان دەکەن ڕۆحی خواوەند تاقانە و ڕۆحی پێغەمبەران لەجەستەی ئێوەدا کۆدەبنەوە و ڕێگەی هەڵە کردنتان لێ دەگرن و بۆ کارە چاکەکان هانتان دەدەن.. باوکی فوارس وەڵامی دایەوە: ئەی پیاو! ئەگەر ڕۆحی خواوەند بێتە ناو جەستەی ئێمە، تۆ چ زیانێکت پێ دەبڕێت؟ ئەگەر ڕۆحی ئیبلیس بێتە ناو جەستەی ئێمە تۆ چ سوودێکت پێ دەبڕێت؟ کەواتە لەوەی هیچ سوود و زیانێك بەتۆ ناگەیێنێت، پرسیار مەکە و لەکارە تایبەتەکانی خۆت ڕێگەی چاکەکاری بگرەبەر. موعتەزید وتی: چ کارێك تایبەتە بەمن؟ باوکی فوارس وتی: دەیڵێم: پێغەمبەر(د.خ) کاتێك کۆچی دوایی کرد کەباوەگەورێی ئێوە، عەباس، زیندوو بوو. ئایا ئەو بانگەوازی خەلافەتی بەرز کردەوە، یا کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەیعەتی بۆ درێژ کرد؟ ئەو کاتەی ئەبوبەکر مردو عومەری وەك جێگری خۆی هەڵبژارد و ئەمە لەکاتێکدا بوو هێشتا عەباس چێژی لەژیان وەردەگرت، بەڵام ئەوی نەکردە جێگری خۆی. عومەر مرد و شەش کەسی بۆ خەلافەت دیاریکرد بەڵام عەباس لەناو ئەواندا نەدەبینرا، کەواتە چۆن ئێوە شیاوی

خەلافەتن لەکاتێکدا هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) هیچ کام لەباوەپیارەکانی ئێوەیان بەشیاو نەدەزانی؟

موعتەزید فەرمانی ئەشکەنجە کردنی ئەوی دەرکرد. هەروەها فەرمانیدا جومگەکانی لەیەك جیابکەنەوە و بەمشێوەیە دەست و پێیان بڕی و گیانیان گرت.

## مەرگی موعتەزید

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە لەشەوی دووشەممە، بیست و دووەمی ئەم مانگە/ هەشتی ئاوریل، موعەتەزید باللە باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی موەفەق کوڕی متوەکیل مرد. ئەو لەزیحەججەی ٢٤٢/ نۆڤەمبەری ٨٥٦ زایینی لەدایك بوو.

کاتێك نەخۆشییەکەی پەرەی سەند، سەرکردەکانی کۆکردەوە. یونسی خزمەتکار، موشگیر و کەسانی دیکە لەناو سەرکردەکاندا دەبینران. ئەوان داویان لەقاسم کوڕی عوبەیداللەی وەزیر کرد بۆ موکتەفی سەرلەنوێ بەیعەت وەربگرێت و وتیان: لەدروست بوونی ئاژاوە دڵنیا نین. وەزیر وتی: ئەم سامانە تایبەتە بەسەروەری باوەڕداران و منداڵەکانی ئەو. دەترسم ئەم سامانە هەزینە بکەم و موعتەزید لەم نەخۆشییە رزگاری بێت و ئەم کارەی من پەسەند نەکات (بەو شێوە بوو دەبوا کاتی بەیعەت بەخشش بەسوپاییەکان بدەن.)

یونسی خزمەتکار وتی: ئەگەر چاك بوویەوە، ئێمە وەڵامی دەدەینەوە وئەگەر خەلافەت بەکوڕەکەی ئەو گەیشت، چیتر سەرکۆنەی ئێمە ناکات چوونکە ئەم سامانەمان بۆ خەلافەتی کوڕەکەی تەرخان کردووە. وەزیر سامانەکەی هەزینە کرد و سەرلەنوێ بەیعەتی وەرگرتەوە. ئەو عەبدولواحید کوڕی موەفەقی هێنا و بەیعەتی لێ وەرگرت. فەرمانی بەدەستەیەکدا چاودێری بکەن. منداڵەکانی موعتەزی هێنا. هەروەها منداڵەکانی مۆئەییەد و عەبدولعەزیز کوڕی موعتەمیدی خستە ژێر چاودێرییەوە و دەستەیەکی بۆ ئەو مەبەستە راسپارد.

کاتێك موعتەزید مرد، وەزیر، یوسف کوڕی یەعقوب و باوکی حازم و باوکی عەمرۆ کوڕی یوسف کوڕی یەعقوبی هێنایە لای جەستەی موعتەزید. محەممەد

کوڕی یوسف جەنازەکەی شۆرد و وەزیر نوێژی لەسەر خوێند و لەشەودا، لەماڵی محەممەد کوڕی تاهیر بەخاك سپێردرا وەزیر لەکۆشکی خەلافەت پرسەی دانا و سەر لەنوێ بۆ موکتەفی بەیعەتی وەرگرتەوە.

دایکی موعتەزید بەناوی زەرار، پێش خەلافەتی موعتەزید مردبوو. خەلافەتی موعتەزید حەوت ساڵ و نۆ مانگ و سێ ڕۆژ درێژەی کێشا.مناڵەکانی ئەو عەلی یا هەمان موکتەفی، جەعفەر یا هەمان موقتەدیر و هارون بون. ئەو یانزە کچ یا بەگومانێك حەڤدە کچی بۆ هاتە دنیا. لەکاتی مەرگی ئەو ئەم هۆنراوەیان هۆنییەوە:

تمتع من الدنيا فانك لا تبقى — و خذ صقوها ما ان صفت ودع الرنقا

و لا تأمن الدهر انني قد امنته — فلم يبق لي خلا و لم يرع لي حقا

قتلت صناديد الرجال و لم ادع — عدوا و لم امهل على طغيه خلقا

و اخليت دار الملك من كل نازع — فشردتهم غربا و مزقتخم شرقا

فلما بلغت النجم عزا و رفعة — و صارت رقاب الخلق اجمع لي رقا

رماني الردى سهما فاخمد جمرتي — فها اناذا في حفرتي عاجلا القى

و لم يغن عني ما جمعت و لم اجد — لذي الملك و الاحياء في حسنها رفقا

فيا ليث شعري بعد موتي ما القى — الى نعم الرحمان ام ناره القى

واتاکەی: کەڵك لەجیهان وەربگرە چوونکە نامێنیتەوە و چێژی لێ وەربگرە تا ئەو کاتەی چێژبەخشە و بەدبەختییەکانی پشتگوێ بخە. لەرۆژگار ئاسوودە مەبە چوونکە من ئاسوودە بووم و هیچ هاوەڵێکی بۆ بەجێنەهێشتم و مافەکانی منی نەگەڕاندەوە. من پیاوە بەهێز و پاڵەوانەکانم کوشت و دوژمنم نەهێشتەوە و مۆڵەتی سەرکێشیم پێنەدا. من تەختی پاشایەتیم لەهەر ئاژاوەگێرێك پاك کردەوە و بۆ رۆژئاوا دوورم خستنەوە و لەرۆژهەلاّت سەرکوتم کردن. کاتێك لەپێگە بەرزیدا هاوشانی ئەستێرەکان بووم و خەڵکان، هەموان بوونە بەندەی من، مەرگ منی کردە نیشانەی خۆی و ئاگری منی دامرکاندەوە و هەنووکە بەخێرایی دەخرێمە ناو گۆڕەکەی خۆم. ئەوەی کۆم کردبوویەوە، هیچ سوودێکی بۆ من نەهێنایە ئاراوە و لەدەسەلاّتدارەکان و زیندووان، هیچ چاکەیەکم نەبینی. خۆزگە دەمزانی دوای

مەرگ چیم بەسەردێت، ئایا بەنیعمەتە خواییەکان دەگەم یا هەڵدەدرێمە ناو دۆزەخەوە.

## ئاکار و کرداری موعتەزید

موعتەزید، گەنم ڕەنگ، لەڕ و بالأیەکی نێوەنجی بوو. نیشانەکانی پیری لەسەر و روخساری دەرکەوتبوو. ئەو، زیرەك، بوێر، جەنگاوەر و بەهێز بوو. سستی و لاوازی لەو نەدەبینرا. کاتێك هەواڵی وەسیف کۆیلەی کوڕی باوکی ساجی پێگەیشت کەعابایەکی زەردی بەسەر شانەوە بوو. دەستبەجێ پەڕییە سەر ئەسپەکەی و وەسیفی بەدەست هێنا و گەڕایەوە. ئەو بەهەمان عابای زەرد هاتە ئەنتاکیە. دەستەیەك لەدانیشتوانی ئەم شارە وتیان: خەلیفە جل و بەرگی ڕەشی لەبەردا نییە. وتیان: ئەو بەهەمان جل و بەرگەوە هاتووە و تا ئێستا دای نەناوە. کەسێکی داوێن پاك بوو.

قازی ئیسماعیل کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ڕۆشتمە لای موعتەزید. لای ئەو چەندین گەنجی جوان روخسارم بینی. سەیرم کردن. کاتێك هەستام، فەرمانی دانیشتنی پێدام. دانیشتم. کاتێك هەموان ڕۆشتن، وتی: ئەی قازی، سوێند بەخوا هیچ کات دۆخینەم بەناڕەوا نەکردۆتەوە.

ئەو لەناو هاوەڵانی پێگەیەکی بەرزی بوو. لەتوڕەیی ئەو دەترسان و لەترسی ئەو لەستەم کردن خۆیان دەپاراست.

## خەلافەتی موکتەفی بالله

کاتێك موعتەزید مرد، وەزیر بەباوکی ئەحمەد عەلی کوڕی موعتەزید یا هەمان موکتەفی بالله نامەیەکی نووسی و ئەوی لەمەرگی باوکی و وەرگرتنی بەیعەت ئاگادار کردەوە. موکتەفی لەم کاتەدا لەڕەققە بوو. کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت، لەسوپای ئەو سەرزەمینە بەیعەتی وەرگرت وپاداشتی پێبەخشین و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و بۆ سەرزەمینی ڕەبیعە و موزێر و دەشتەکییەکان کەسانێکی

وەك كارگوزار دەستنيشان كرد تا پارێزگاری ئەو كەنارانە بكەن. ئەو لەهەشتی جومادی الاوەل/ بيست و يەكی ئاوريل گەيشتە بەغداد.

كاتێك موكتەفی گەيشتە بەغداد، فەرمانيدا هەموو سياچاڵەكان كەباوكی بۆ سزادانی تاوانباران دروستی كردبوو، وێران بكەن.

## چۆنيەتی كوژرانی عەمرۆ كوڕی لەيسی سەفار

لەو رۆژەی موكتەفی هاتە بەغداد، عەمرۆ كوڕی لەيسی سەفار كوژرا و بەيانی ئەو رۆژە بەخاكيان سپارد.

موعتەزيد دوای ئەوەی بەهۆی نەخۆشييەوە توانای قسەكردنی نەما، سافی خوڕەمی بانگ كرد و بەئيشارەی دەست و چاو و هێنانی پەنجەی بەسەر ملی خۆی، فەرمانی پێدا عەمرۆ بكوژێت. موعتەزيد دەستی بەسەر چاوێكی خۆيدا هێنا تا تێبگات كەمەبەستی عەمرۆيە، چوونكە عەمرۆ يەكچاو بوو، دەستی بەگەردنيدا هێنا تا تێبگات بۆ ئەوەی سەری ببڕێت. سافی لەبەر ئەوەی دەيزانی موعتەزيد بەم نزيكانە دەمرێت، مەرگی عەمرۆی دواخست. موكتەفی كاتێك گەيشتە بەغداد، سەبارەت بەعەمرۆ لەوەزير پرسياری كرد. وەزير وەڵامی دايەوە كەهێشتا زيندووە و موكتەفی شادمان بوو. موكتەفی بڕياريدا دڵنەوايی عەمرۆ بكات و رێزی بگرێت چوونكە كاتێك عەمرۆ لەڕەی بوو، دياری فراوان و گرانبايی بۆ موكتەفی دەنارد. قاسم كوڕی عوبەيداللەی وەزير ئەمەی پەسەند نەكرد و بەشێوەيەكی نهێنی كەسێكی نارد و خوێنی عەمرۆی ڕشت.

## زاڵبوونی محەممەد كوڕی هارون لەڕەی

لەم ساڵەدا دانيشتوانی ڕەی نامەيان بۆ محەممەد كوڕی هارون نووسی كە لەگەڵ محەممەد كوڕی زەيدی عەلەوی شەڕی كردبوو و بەناوی ئيسماعيل كوڕی ئەحمەد (سامانی) فەرمانڕەوايەتی تەبەرستانی دەكرد. محەممەد كوڕی هارون، لەو كاتەدا گوێڕايەڵ و شوێنكەوتەی ئيسماعيل نەبوو. دانيشتوانی ڕەی داوايان

لەمحەممەد کوڕی هارون کرد بڕواتە لایان و شارەکەی ئەوان بگرێتەدەست.

هۆکاری ئەوان بۆ ئەم کارە ئەوە بوو فەرمانڕەوای ئەوان، بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ دەکردن. محەممەد کوڕی هارون بەرەو ڕەی بەرێکەوت و دەتمەشی تورك، فەرمانڕەوای ئەو شارە ڕووبەرووی بوویەوە. محەممەد کوڕی هارون ئەو و دوو کوڕەکەی و براکەی کەیغەلەغ، لەسەرکردەکانی خەلیفەی کوشت و ڕۆشتە ناو شارەکە. محەممەد لەرەجەب/ جون سەرکەوتنی بەدەست هێنا.،

## چۆنیەتی کوژرانی بەدر

لەم ساڵەدا بەدر، کۆیلەی موعتەزید کوژرا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو قاسمی وەزیر دەیویست دوای مەرگی موعتەزید، خەلافەت لەمناڵەکانی ئەو وەربگرێتەوە. ئەو لەکاتی زیندوو بونی موعتەزید، بەدری لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار کردەوە و سوێندیدا ئەم نهێنییە لای کەس نەدرکێنێت. بەدر وتی: ڕێگە نادەم خەلافەت لەمناڵەکانی خەلیفە و ئەو کەسەی ڕۆژانەم پێدەدات، وەربگیرێتەوە. قاسمی وەزیر نەیتوانی لەگەڵ بەدر ناسازگاری بکات چوونکە سوپاسالاری لەشکر بوو بەڵام ڕقی بەدری لەدڵ گرت. کاتێك موعتەزید مرد، بەدر لەفارس بوو. قاسم بۆ موکتەفی لەڕەققە نامەی نووسی و بەیعەتی بۆ وەرگرت. موکتەفی لەرۆژگاری ژیانی باوکی، لەو دوور بوو. قاسمی وەزیر هەوڵیدا بەدر لەناو ببات بۆ ئەوەی نهێنییەکەی لای موکتەفی ئاشکرا نەبێت. موکتەفی، محەممەد کوڕی کەشتەمەری لەگەڵ نامەکان بۆ لای سەرکردەکان نارد و فەرمانی پێدان بەدر بەجێبێڵن و ڕووبکەنە بارەگاکەی. دەستەیەك وەك عەباس کوڕی عەمرۆ غەنەوی و محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیق و خاقانی موفلیحی و دەستەیەکی دیکە هاتنە لای موکتەفی. موکتەفی ڕێزی گرتن و بەدر بەناچاری بەرەو واست بەرێکەوت. موکتەفی ماڵەکەی ئەوی خستە ژێر چاودێرییەوە و هاوەڵان و سەرکردەکانی ئەوی زیندانی کرد وفەرمانیدا ناوی بەدر لەسەر ئاڵا و قەڵغانەکان بسڕنەوە و حسەین کوڕی عەلی کورەی لەگەڵ سوپایەك بەرەو واست ڕەوانە کرد.

موکتەفی نێردراوێکی بۆ لای بەدر نارد تا فەرمانڕەوایەتی هەر سەرزەمینێك

دەخوازێت، بەو ببەخشێت، بەڵام بەدر رازی نەبوو و وتی: هیچ رێگە چارەیەك نییە مەگەر ئەوەی بڕۆمە بارەگای سەرورەی باوەڕداران. قاسم کوڕی عوبەیدالله لەدەرئەنجامی دیداری بەدر و موکتەفی دەترسا و لەم کاتەدا گۆرەپانی بۆ ئاژاوە نانەوە بەچۆڵ بینی و موکتەفی لەهاتن و یاخی بوونی ئەو ترساند. بەدریان ئاگادار کردەوە کەکەسانێکیان بۆ چاودێری کردنیماڵەکەی داناوە و کۆیلە و کەسەکانیان گرتووە. کەسی نارد تا بەشێوەیەکی نهێنی هیلالی کوڕی بۆ بێنن. وەزیر لەم مەبەستە ئاگادار بوویەوە و فەرمانیدا چاودێری کوڕەکە بکەن. ئەوسا باوکی حازم، قازی رۆژهەڵاتی بانگ کرد و فەرمانی پێدا بڕواتە لای بەدر و دڵی ئەو لەموکتەفی پاك بکاتەوە و لەلایەن موکتەفییەوە ئەمان بەخۆی و بنەماڵەکەی بدات. باوکی حازم وتی: دەبێت ئەم فەرمانە لەزمانی سەروەری باوەڕدارانەوە ببیستم. وەزیر ئەوی گەڕاندەوە و باوکی عومەری قازی بانگ کرد و هەمان فەرمانی پێدا. باوکی عومەر رازی بوو. باوکی عومەر لەگەڵ ئەمان نامە بەرێکەوت. بەدر لەرێگەی واستەوە بەرەو بەغداد کەوتە رێ. وەزیر کەسێکی بۆ کوشتنی ئەو نارد. کاتێك بەدر لەمەرگی خۆی دڵنیا بوو، داوای کرد رێگەی بدەن دوو رەکعەت نوێژ بخوێنێت. دوو رەکعەت نوێژی خوێند و سەریان لەجەستەی جیا کردەوە. ئەم پێشهاتە لەرۆژی هەینی، شەشی رەمەزان/ پانزەی ئۆگۆست روویدا. سەریان هەڵگرت و جەستەیان بەجێهێشت. هاوسەرەکەی بەشێوەیەکی نهێنی کەسی نارد تا جەنازەکەی بخەنە ناو تابووت. لەکاتی حەج جەنازەکەیان بردە مەککە و لەوێ بەخاکیان سپارد چوونکە وەسیەتی خۆی بوو. بەدر پێش مردن هەموو کۆیلە و کەنیزەکانی خۆی ئازاد کرد.

باوکی عومەر دوای ئەنجامدانی ئەم کارە، خەمبار و پەشیمان لەوەی ئەنجامیدابوو، بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە. خەڵکان سەبارەت بەو چەندین هۆنراوەیان هۆنییەوە. ئەمە یەکێك لەو هۆنراوانەیە:

| | |
|---|---|
| قل لقاضی مدینة المنصور | بم احللت اخذ راس الامیر |
| عند اعطائه المواثیق و العهــ | ــد و عقد الایمان فی منشور |
| این ایمانك التی شهد اللــــ | ــعلی انها یمین فجور |

ان كفيك ى تفارق كفيـــ ـــه الى ان ترى عليل السرير

يا قليل الحياء يا اكذب الامـــ ـــه يا شاهدا شهادة زور

ليس هذا فعا القضاة و لا يحـــ ـــسن امثاله و لاة الجسور

اى امر ركبت فى الجمعة الزهـــ راء منه خير هذى الشهور

قد مضى من قتلت فى رمضا ن صائما بعد سجدة التعفير

يا بنى يوسف ين يعقوب اضحى اهل بغداذ منكم فى غرور

بدد الله شملكم و ارانى ذلكم فى حياة هذا الوزير

فاعدوا الجواب للحكم العد ل و من بعد منكر و نكير

انتم كلكم فدى لابى حا زم المستقيم كل الامور

واتاکەی: بەقازی شاری مەنسور بڵێ لەبەرچی جیاکردنەوەی سەری ئەمیرت بەڕەوا زانی؟ لەدوای ئەوەی بەڵێن و پەیمانی نووسراوت بەودا و سوێندت بۆ خوارد. لەکوێیە ئەو سوێندەی تۆ کەخوا دەزانێت درۆ بوو و سوێندی خراپەکارێکە. وتت دەستەکانی تۆ دەستەکانی ئەو بەرنادات تا ئەو کاتەی خەلیفە ببینێت. ئەی بێ شەرم، ئەی درۆزنترینی هەموو خەڵکان. ئەی شایەتی دەری شایەتی ناڕاست، ئەم کارە شیاوی قازییەکان نییە و هاوشێوەی ئەم کارە شیاوی پاسەوانەکانی سەر پردەکەیش نییە. لەو هەینییە درەوشاوەی ئەم مانگەدا کەباشترینی مانگەکانە، چ کارێکی قێزەونت ئەنجامدا. کەسێك کە لەمانگی رەمەزان و لەکاتێکدا بەرۆژوو بوو، کوشتت و دوای سوجدە گیانی سپارد. ئەی بنەماڵەی یوسف کوڕی یەعقوب! خەڵکانی بەغداد فریوی ئێوەیان خوارد. خواوەند بڵاوە بەدەستەکانی ئێوە بکات و لەژیانی ئەم وەزیرە ریسواییتان پێببەخشێت. وەڵامی داوەری دادپەروەری بەدوای نەکیر و مونکیر ئامادە بکە. هەمووی ئێوە قوربانی باوکی حازم بن (قازی) کە لەهەموو کارەکان خۆڕاگری دەکاتە پیشە.

## فەرمانڕەوایی باوکی عەباس عەبدوللە کوڕی ئیبراهیم لەئەفریقییە

لەڕووداوەکانی ساڵی ٨٧٤/٢٦١ زایینی باسمان کرد کەئیبراهیم کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، لەساڵی ٩٠٢/٢٨٩ زایینی منداڵەکەی، باوکی عەباسی وەك جێگری خۆی هەڵبژارد و لەهەمان ساڵ مرد. کاتێك ئیبراهیم مرد، باوکی عەباس لەسەر تەخت دانیشت. ئیبراهیم پیاوێکی قسەزان، بیرمەند، بوێر و یەکێك لەشاسوارە بەناوبانگەکانی ئەو رۆژگارە بوو. شارەزای کاروباری پەیوەندیدار بەجەنگ بوو.

ئەو زانا و لەگفتوگۆدا بەتوانا بوو. لەرۆژگاری ئەو پێگەی باوکی عەبدوللەی شیعی (دامەزرێنەری دەوڵەتی فاتیمی) بەرز بوویەوە. ئیبراهیم، ئەحوەلی برای بۆ جەنگی عەبدوللە نارد. براکەی ئەو (ئەحوەل) خێل نەبوو، بۆیە بەم ناوە بانگیان دەکرد چوونکە کاتێك زۆر سەیری شتێکی دەکرد، پێڵووەکانی شۆڕ دەبوونەوە و لەبەر ئەمە ئەم نازناوەیان پێبەخشی. کاتێك عەبدوللە لەهێرشەکەی ئەحوەل ئاگادار بوویەوە، بەسوپایەکی گەورە رووبەرووی بوویەوە. دوو سوپا لەکەموشە جەنگان و ژمارەیەکی زۆر لەهەر دوولا کوژران و ئەحوەل شکستی خوارد بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خۆڕاگری کردە پیشە.

باوکی عەباس لەکاتی زیندوو بوونی باوکی زۆر لێی دەترسا چوونکە کردەوەکانی باوکی ئازاردەر بوو. باوکی فەرمانڕەوایەتی سەقەلییەی بەو سپارد و باوکی عەباس توانیبووی دەست بەسەر زۆر لەناوچەکانی ئەو سەرزەمینەدا بگرێت. لەکاتی ئاماژەدان بەفەرمانڕەوایەتی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد، باسی ئەم بابەتەمان کرد. کاتێك باوکی عەباس فەرمانڕەوایەتی ئەفریقییەی کرد، نامەیەکی بۆ کارگوزارەکان نووسی تا بۆ خەڵکانی بخوێننەوە. ئەو بەڵێنی چاکەکاری، دادپەوەری، چاکەکاری وهەوڵدانی بەخەڵکاندا و بەڵێنەکانی خۆی هێنایەدی. ئەو دەستەیەك لەزاناکانی کۆکردەوە تا بۆ ئەم مەبەستە هاوکاری بکەن.

ئەو هەندێ کات هۆنراوەی دەهۆنییەوە. ئەم هۆنراوەی لەسەقەلییە و پێش

خواردنی دەرمان، هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| شربت الدواء على غربة | بعيدا من الاهل و المنزل |
| و كنت اذا ما شربت الدواء | اطيب بالمسك و المنذل |
| و قد صار شربى بحار الدما | و نقع العجاجة و القسطل |

واتاکەی: لەگەڵ ئەوەی لەماڵ و حاڵی خۆم دوورم، دەرمانم خوارد. پێشتر هەرکاتێك دەرمانم دەخوارد، بەموشك و عودی بۆنخۆش شادمانیان دەکردم. هەنووکە دەریای خوێن، نۆشی گیانی منە بەتەپ و تۆزی بەرزەوە بوو لەجەنگ و شەڕ.

باوکی عەباس ئاگادار بوویەوە کەکوڕەکەی باوکی موزێر زیادە الله، فەرمانڕەوای سەقەلییە، تەنیا سەرقاڵی خواردنەوە و رابواردنە. باوکی عەباس کوڕەکەی خۆی لەسەر کار لابرد و محەممەد کوڕی سەرقوسی لەجێگەی ئەو دانیشاند و باوکی موزێری زیندانی کرد. کاتێك شەوی چوارشەممەی کۆتایی شەعبانی ساڵی ٢٩٠/ دوانزەی ئۆگۆستی ٩٠٣ زایینی دەستی پێکرد، باوکی عەباس کوژرا. سێ لەکۆیلە سەقلەبییەکان بەهاوکاری کوڕەکەی خوێنیان ڕشت وسەری ئەویان بۆ لای باوکی موزێر لەزیندان نارد. ئەو، ئەم سێ کەسەی کوشت و لەداریدان لەگەڵ ئەوەی باسمان کرد خۆی پلانی کوشتنی باوکی داڕشتبوو. باوکی عەباس یەك ساڵ و پەنجا و دوو ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد. نشینگە و شوێنی کوژرانی ئەو تونس بوو.

باوکی عەباس دادپەروەر بوو. دەستەیەکی فراوانی کۆکردبوویەوە تا بۆ بلاو کردنەوەی دادپەروەری هاوکاری بکەن و ئەو لەباروودۆخی خەڵکان ئاگادار بکەنەوە. فەرمانی بەقازی شارەکەدابوو تەنانەت لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی داوەری بکات. قازی ئەو کارەی کرد. کاتێك باوکی عەباس کوژرا، باوکی موزێر هاتەسەر کار. کردەوە و کارەکانی ئەو لەساڵی ٩٠٩/٢٩٦ زایینی ئاماژەی پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەنیوەی ڕەمەزان/ بیست و چواری ئۆگۆستی ئەم ساڵە، عەبدولواحید کوڕی موەفەق کوژرا. هەرکات دایکی پرسیاری ئەوی دەکرد پێیان دەوت عەبدولواحید لەکۆشکی موکتەفیدایە. کاتێك موکتەفی مرد، دایکی عەبدولواحید لەزیندوو بوونی کوڕەکەی بێ هیوا بوو و پرسەی بۆ دانا.

لەم ساڵەدا لەنێوان هاوەڵانی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد و کوڕی جوستانی دەیلەمی لەتەبەرستان جەنگ ڕوویدا و سەرئەنجام، کوڕی جوستان شکستی خوارد.

لەم ساڵەدا ئیسحاقی فەرغانی لەهاوەڵانی بەدر، لەسارا ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. موکتەفی سوپایەکی بەفەرماندەیی باوکی ئەغوڕ بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. باوکی ئەغوڕ ڕووبەرووی بوویەوە و ئیسحاق شکستی پێهێنا و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەوی کوشت.

هەروەها لەم ساڵەدا خاقانی موفلیحی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو ڕەی بەرێکەوت تا فەرمانڕەوایەتی ئەو شارە بگرێتەدەست.

لەم ساڵەدا خەڵکانی حیمس و بەغداد لەهاوین نوێژی ترسیان خوێند. ئەم نوێژە لەکاتی ئێوارێدا بوو کە لای باکورەوە بایەکی توند هەڵیکرد و ساردی هەوای لێکەوتەوە. بەرادەیەك سارد بوو کەخەڵکان ناچار بەهەڵکردنی ئاگر بوون و هەموان جل و بەرگی زستانەیان لەبەر کرد. ساردی هەوا بووە هۆی بەستنی ئاو.

لەم ساڵەدا لەنێوان ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی و محەممەد کوڕی هارون لەڕەی جەنگ ڕوویدا و محەممەد شکستی خوارد. ئەو بەرەو لای دەیلەمییەکان هەڵات و داوای پەنای کرد. ئیسماعیل ڕۆشتە ناو ڕەی.

لەم ساڵەدا ئاوی دیجلە گەیشتە پانزە زەراع.

لەجومادی الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە، موکتەفی بەهیلال کوڕی بەدر و هاوەڵەکانی باوکی پاداشتی بەخشی.

لەم ساڵەدا ڕەشەبایەکی بەهێز لەبەسرە هەڵیکرد و ژمارەیەکی زۆر

لەدارخورماکانی هەڵکەند و چەند شوێنێکی شارەکە داڕما و شەش هەزار کەس کوژران. بەغدادیش لەمانگی رەجەب/ بەردەوام گرفتاری ئەردهەژێن بوو. دانیشتوانی ئەم شارە لەمزگەوت دەستیان بەپاڕانەوە کرد و ئەردهەژێنەکان کۆتایی هات.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی حەمزە کوڕی محەممەد کوڕی ئیبراهیمی سۆفی کەهاوشێوەی سەری سەقەتی و لەکەسە نزیکەکانی ئەو بوو، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەدی کۆچی (٩٠٣ زایینی)

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان

لەرەبیع الاخر/ مارسی ئەم ساڵە، توغج کوڕی جوف( فەرمانڕەوای دیمەشق) سوپایەکی بۆ جەنگ لەگەڵ قەرەمتی ڕەوانە کرد. فەرماندەی ئەم سوپایە کۆیلەیەك بوو بەناوی بەشیر. قارەمتی شکستی پێهێنان و بەشیری کوشت.

دواتر قەرەمتی گەمارۆی خستە سەر دیمەشق و بارودۆخی لەدانیشتوانەکەی دژوار کرد و هاوەڵانی توغجی لەناو برد. تەنیا کەمێك لەهاوەڵانی زیندوو مانەوە و دانیشتوانی ئەم شارە کەوتنە هەڵدێری مەرگەوە. دەستەیەك لەخەڵکانی بەغداد (دانیشتوی دیمەشق) خەلیفەیان لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە و داوای هاوکارییان لێکرد. ئەو بەڵێنی هاوکاری پێدان. خەڵکانی میسر بەبەدر و سەرکردەکانی دیکە، هاوکاری خەڵکانی دیمەشقیان کرد و لەگەڵ شێخ، سەرۆکی قەرەمتییەکان جەنگان و لەکەنار دەروازەی دیمەشق، خوێنی شێخیان ڕشت.. لەم جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لەقەرەمتییەکان کوژران.

ئەم قەرەمتییە یا هەمان شێخ بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەگەر بەدەستی خۆی ئیشارە لەریزی دوژمنەکانی بکات، تێکیان دەشکێنێت. کاتێك خۆی و هاوەڵانی کوژران، پاشماوەی سوپاکەی بۆ سەرکردایەتی براکەی، حسەین، هاودەنگ بوون. حسەین خۆی بەئەحمەد ناو برد و نازناوی باوکی عەباسی لەخۆی نا وپێشنیاری پەیوەست بوونی خەڵکانی بەخۆی کرد. ژمارەیەکی زۆر لەعەرەبەکان و کەسانی دیکە پەیوەستی بوون و پێگەی بەرز بوویەوە. خاڵێك لەروخساری دەرکەوت. ئەم خاڵەی بەمۆجیزەی خۆی ناوبرد. لەبەر ئەمە ڕوویکردە دیمەشق و دانیشتوانی ئەو شارە بەدانی باج ڕازی بوون.

دواتر مەبەستی کەنارەکانی حیمسی کرد و دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرت. لەسەر مینبەرەکان بەناوی ئەو وتاریان خوێندەوە و ئەو مەهدی، بەسەرووەری باوەڕداران ناو برد. کوڕە مامی ئەو عیسا کوڕی مەهدی کە بەعەبدوالله کوڕی

ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل ناودەبرا، پەیوەستی بوو و مەهدی نازناوی مودەسری (مدثر) پێ بەخشی و بانگەشەی ئەوەی کرد ئەو هەمان مودەسیری قورئانە. نازناوی متوەقی (مطوق) بەیەکێك لەکۆیلەکانی بنەماڵەکەی بەخشی و فەرمانی پێدا خوێنی ئەسیرە موسوڵمانەکان بڕێژێت.

دوای ئەوەی دانیشتوانی حیمس گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆیان نیشاندا و لەترسا، دەروازەی شارەکەیان بۆ کردەوە، ئەو ڕێگەی حەمات و مەعەرەت ئەلنەعمانی گرتەبەر و دانیشتوانی ئەو ناوچەی کوشتار و ژن و منداڵەکانی ئەسیر کرد. دواتر هێرشی کردە سەر خەڵکانی بەعلەبەك و ئەوانی کوشت. تەنیا ژمارەیەکی کەم لەوان زیندوو مانەوە. دواتر ڕێگەی سەلەمییەی گرتەبەر و دانیشتوانی ئەو شارە ڕێگە چوونە ناو شارەکەیان لێگرت بەلام دواتر ڕێگەی سازانیان گرتەبەر و ئەو، ئەمانی پێبەخشین و خەڵکان دەروازەکانی شارەکەیان بۆ کردەوە. کاتێك هاتە ناو شارەکە، سەرەتا منداڵەکانی هاشمی کوشتار کرد کەژمارەیەکی کەم بوون. دواتر چوارپێکانی کوشت و بەدوای ئەوان دەستی بەکوشتنی ئەو منالأنە کرد کە لەمەکتبەخانە (فێرگە) سەرقاڵی خوێندنی زانست بوون. دوای ئەوان هەموو گەورە و سەرکردەکانی شارەکەی کوشت. ئەو کاتێك لەشارەکە ڕۆشتەدەر کەهیچ چاوێك کراوە نەبوو. لەگوندەکانی دەوروبەری سەلەمییە خەڵکانی ئەسیر دەکرد و دەیکوشتن و ڕێگەکانی دەبڕی.

لەپزیشکێك کە لەکەنار دەروازەی محوەل بوو بەناوی باوکی حسەین، دەگێڕنەوە کەوتی: دوای ئەوەی قەرەمتی خاڵدار بڕایە بەغداد (ئەسیر کرا) ژنێك هاتە لای من و وتی: دەمەوێت برینی شانم دەرمان بکەیت. وتم: لەوێ ژنێکی لێیە کەچارەسەری ژنان دەکات. ژن چاوەڕوانی هاتنی ژنەکە بوو، دانیشت و فرمێسکی لەچاو باراند. پرسیارم لێکرد. وتی: کوڕێکم بوو، منی بەجێهێشت و ڕۆشت و نەگەڕانەوەی درێژەی کێشا. بۆ دۆزینەوەی ئەو بەرێکەوتم و هەموو سەرزەمینەکان گەڕام بەلأم سۆراغم نەکرد. کاتێك لەرەققە ڕۆشتمەدەر، لەناکاو خۆم لەناو ئوردووگای قەرەمتییەکان بینی و لەوێ کوڕەکەی خۆم دۆزییەوە. لەبارودۆخی خۆم وخوشکەکانی سکالأم بەرز کردەوە. وتی: هەنووکە واز لەو قسانە بێنە و

لەدینی خۆت ئاگادارم بکەرەوە. وتم: ئایا تۆ ئایینی من نازانیت؟ وتی: ئەو دینەی پێشوومان، بێهوودە بووە و ئایینی راست، ئەوەیە ئێمە شوێنی کەوتووین. لەقسەکەی سەرم سوڕما. منی بەجێهێشت و ڕۆشت و لەتێ گۆشت و نانی بۆ ناردم. دەستم لەگۆشت و نانەکە نەدا تا خۆی هات و خواردنی ئامادە کرد.

لەم کاتەدا پیاوێك لەهاورێکانی کوڕەکەم هات و لەمنی پرسی ئایا لەکاروباری ژنان هیچ دەزانم. بەبەڵێ وەڵامم دایەوە. منی بردەماڵێك. ژنێکی دوو گیانم بینی. لای ئەو دانیشتم و دەستم بەقسە کردن کرد بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە تا منداڵەکەی بۆ هاتە دنیا. بەرادەیەك خۆشەویستی خۆم پێشکەش کرد کەکەوتە گۆ. پرسیاری بارودۆخیم کرد. وتی: ژنێکی هاشمیم. ئەم دەستەیە ئێمەیان گرفتار کرد و باوك و هەموو پیاوانی بنەماڵەکەیان سەر بڕین. فەرمانڕەوای ئەوان منی گرت و بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ منی لای خۆی هێشتەوە. دواتر فەرمانی کوشتنی منی دەرکرد. چەند کەس لەسەرکردەکانی ئەو داوای منیان کرد. ئەو منی بەیەکێك لەوان سپارد و من لەگەڵ هەر چواریان خەوتووم و سوێند بەخوا نازانم کێ باوکی ئەم منداڵەیە.

ئەم ژنە (ژنی یەکەم) بەم شێوەیە درێژە بەبەسەرهاتەکەی خۆی دەدات: پیاوێك هات و ئەو ژنە بەمنی وت: پیرۆزبایی لێ بکە. منیش پیرۆزباییم لێکرد و ئەو زیوی پێدام. پیاوێکی دیکە هات و دوای ئەو پیاوێکی دیکە هاتەژوور و من پیرۆزباییم لەهەموویان کرد و هەرکامیان کەمێك زیوی پێدام تا ئەوەی پیاوی چوارەم لەگەڵ دەستەیەك هات. پیرۆزباییم لەویش کرد و ئەویش دەهەزار درهەمی پێبەخشیم. ئەو شەوەمان کردە ڕۆژ و کاتێك لەخەو هەستاین، بەو ژنەم وت: هەنووکە پێویستە سپاسی تۆ بکەم، خواوەندا، خواوەندا، ڕزگارمان بکە. وتی: لەکێ؟ بەسەرهاتی کوڕەکەم بۆ باس کرد. وتی: بڕۆ لای ئەو پیاوەی دوای هەموان پیرۆزباییت لێکرد. ئەو ڕۆژە مامەوە و کاتێك ئێوارێ داهات و ئەو پیاوە هاتە ژوور، هەستام و دەست و پێیم ماچ کرد و وتم: بەوەی بەمنت بەخشی، بێ نیاز بووم، ڕێگە بدە بۆ لای کچەکانم بگەڕێمەوە. ئەو دەستەیەك لەکۆیلەکانی خۆی بانگ کرد و فەرمانی پێدان من ببەنە فلانە شوێن. پێی وتن: لەفلانە شوێن ئازادی بکەن و بگەڕێنەوە. ئەوان تا

ده فەرسەنگ لەگەڵم هاتن. لەم کاتەدا کوڕەکەم خۆی پێگەیاندین و بەشمشێر بریندارى کردم بەڵام سوارەکان ڕێگەیان لێگرت[٢٢]. منیان بردە ئەو شوێنە فەرمانده‌کەیان فەرمانیدابوو. لەوێ بەرەڵایان کردم و هەنووکە لێرەم.

ئەو ژنە بەم شێوەیە درێژە بەبەسەرهاتەکەی خۆی دەدات: کاتێك خەلیفە، قەرەمتی و هاوەڵە گرفتارەکانی ئەوی هێنایەدەر، ڕۆشتم بۆ ئەوەی سەیریان بکەم. کوڕەکەم لەناو ئەواندا بینی کەسوار وشتریان کردبوو. کڵاوێکی درێژی لەسەردابوو و فەرمێسك لەچاوەکانی دەباری. پێم وت: خواوەند ڕەنجی تۆ کەم نەکات و لەم گرفتارییە رزگاریت پێ نەبەخشێت.

نامەی خەڵکانی شام و میسر بەدەستی موکتەفی گەیشت کەنووسرابوو قەرەمتی کوشتی و بردی و فڕاندی و تاڵانی کرد. موکتەفی سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و لەرەمەزان/ جولای لەبەغداد هاتەدەر وڕێگەی شامی گرتەبەر و لەموسڵەوە ڕێگەی خۆی دیاریکرد. ئەو باوکی ئەغوری لەگەڵ دە هەزار سەرباز وەك پێشەنگ ڕەوانە کرد. باوکی ئەغور لەنزیك حەلەب ئوردووی لێدا. قەرەمتی خاڵدار بەشێوەیەکی لەناوکاو هێرشی کردنەسەر و ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپاکەی باوکی ئەغوری کوشت بەڵام خۆی (باوکی ئەغور) زیانی بەرنەکەوت و لەگەڵ هەزار سەرباز هاتە ناو حەلەب. ئەم جەنگە لەرەمەزان/ جولای ڕوویدا. قەرەمتی خۆی گەیاندە دەروازەی حەلەب. باوکی ئەغور لەگەڵ پاشماوەی سەربازەکانی و دانیشتوانی شارەکە ڕووبەڕووی بوویەوە و قەرەمتی ناچار پاشەکشێی کرد.

موکتەفی هات و گەیشتە ڕەققە و سوپاکەی بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد. محەممەد کوڕی سلێمانی کاتبی وەك فەرمانده‌ی ئەوان دەستنیشان کرد.

لەشەوال/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە قەرەمتی خاڵدار لەگەڵ بەدر، موالی کوڕی تولون، جەنگی و قەرەمتی شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەشوێنکەوتەکانی لەخوێنی خۆیاندا گەوزان و ئەوەی رزگاری بوو، ڕێگەی سارا و دەشتی گرتەبەر. موکتەفی، حسەین کوڕی حەمدان و سەرکردەکانی بۆ شوێنکەوتنی ئەوان ڕەوانە کرد.

---

[٢٢]- لەمێژووی تەبەریدا هاتووە ئەو بۆیە دایکی بریندار کرد چوونکە گومانی دەکرد دەروات خوشکەکانی بێنێت و تەسلیم بەقەرەمتییەکانی بکات. (وەرگێڕ)

لەم ساڵەدا کوڕی بانوا، فەرمانڕەوای بەحرەین، هێرشی کردە سەر قەڵایەکی قەرەمتییەکان و دەستی بەسەردا گرت. یەکێك لەکەسە نزیکەکانی باوکی سەعیدی جەنابی ڕووبەڕووی کوڕی بانوا بوویەوە بەڵام شکستی خوارد. ئەم قەرەمتییە، جێگری باوکی سەعید و فەرمانڕەوای قەتیف بوو. دوای شکستی ، هاوەڵانی ئەویان بەکوژراو بینی. سەریان بڕی و کوڕی بانوا ڕێگەی قەتیفی گرتەبەر و دەستی بەسەردا گرت.

## گرفتار بوونی محەممەد کوڕی هارون

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی هارون ئەسیر کرا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو موکتەفی فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ڕەی بۆ ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی نارد. ئیسماعیل ڕێگەی ڕەی گرتەبەر. لەم کاتەدا ڕەی لەژێر فەرمانی محەممەد کوڕی هارون بوو. هارون بەرەو قەزوێن و زەنجان ڕۆشت و لەوێوە بۆ تەبەرستان گەڕایەوە. ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد، بارسی کەبیری وەك کارگوزاری جورجان دەستنیشان و داوای لێکرد محەممەد کوڕی هارون بەجەنگ یا بەسازان بگرێت. بارس نامەی بۆ محەممەد کوڕی هارون نووسی و بەڵێنی پێدا بارودۆخی لەگەڵ ئیسماعیل سامان بدات. محەممەد بەوتەکانی ڕازی بوو و لەجوستانی دەیلەمی خۆی بەدوور گرت و مەبەستی بوخارای کرد. کاتێك گەیشتە مەرو، ئەویان گرت و قۆڵبەستیان کرد. ئەم پێشهاتە لەشەعبان/ جونی ئەم ساڵە ٢٩٠/٩٠٣ زایینی ڕوویدا. دواتر ئەویان بردە بوخارا و سوار لەسەر وشتر بردیانە ناو شارەکە. لەوێ بۆ ماوەی دوو مانگ زیندانی کرا و لەوێ مرد.

محەممەد کوڕی هارون سەرەتا پینەچی بوو. دواتر دەستەیەك لەخراپەکارانی کۆکردەوە و لەڕێگەی مەفازەی سەرەخس دەستی بەچەتەیی کرد. دواتر داوای ئەمانی لەرافیع کوڕی هەرسیمە کرد و لای ئەو مایەوە تا عەمرۆ کوڕی سەفار شکستی خوارد. دوای کوژرانی رافیع داوای ئەمانی لەئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی کرد. ئیسماعیل فەرمانڕەوایەتی ماوەرائەلنەهری دەکرد. ئیسماعیل ئەوی بۆ جەنگی محەممەد کوڕی زەید ڕەوانە کرد – پێشتر ئاماژەمان پێدا–. خەواق ئەم

بەسەرهاتەی لەهۆنراوەکەی خۆیدا باس کردووە:

| | |
|---|---|
| کان ابن هارون خیاطا له ابر | و رایة سامها عشرا بقیراط |
| فانسل فی الارض یبغی الملك فی عسب | زط و نوب و اکراد و انباط |
| انی ینال الثرسا کف ملتزق | بالترب عن ذروة العلیاء هباط |
| صبرا امیرك اسماعیل منقتم | منه و من کل غدار و خیاط |
| رایت عیرا سما جهلا علی اسد | یا عین ویحك ما اشقاك من شاطی |

واتاکەی: کوڕی هارون، پینەچی و خاوەنی دەرزییەکان بوو. ئالأیەکی بوو کەبەهاکەی دە پەشیزە. ئەو بۆ بەدەست هێنانی فەرمانڕەوایەتی شوێن چەند دەستەیەك کەوت. ئەو دەستانە لەخەڵکانی زەت (خەڵکانی هیند و سند) و نوب (سوپایی ئەفریقییە لەنوبە و کوردەکان و ئەنبات (دانیشتوانی نێوان بەین ئەلنەهرەین کە نەتازی بوون و نەپارسی) بوون. چۆن دەستی کەسێك بەسورەییا دەگات کەریسوا بووە و لەپێگە بەرزەکان هاتبێتەخوارەوە. خۆڕاگر بە کەفەرمانڕەوای تۆ ئیسماعیل لەهەر خیانەتکار و خەیاتێك تۆڵە دەستێنێت. ئایا بینیوتە کەر لەنەزانیدا بخوازێت پێش شێر بکەوێت. ئەی چاو، چەندە بەدبەخت و ڕەشبین بیت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەرەبیع الاخر/ مارسی ئەم ساڵە بەباوکی عەشایر ئەحمەد کوڕی نەسر خەڵات بەخشرا و فەرمانڕەوایەتی تەرسوسی گرتەدەست و موزەفەر کوڕی حاج لەبەر گەورەیی سنورنشینەکان، لەفەرمانڕەوایەتی تەرسوس دوورخرایەوە.

لەم ساڵەدا تاهیر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی لەیس بۆ فەرمانڕەوایەتی فارس دەستنیشان کرا و سامانەکانی بۆ پایتەخت برد. موکتەفی ئاڵای ئەو سامانەی بۆ هەڵکرد.

لەجومادی الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە، باوکی سەعیدی خوارەزمی کە داوای ئەمانی لەخەلیفە کردبوو، هەڵات ورێگەی موسڵی گرتەبەر. ئەو بەعەبدوالله، ناسراو بەغولامی نون، لەتکریت نامەیەکی نووسی و خوازیاری بینینی ئەوبوو.

عەبدوللە فەرمانڕەوایەتی ئەم ناوچەی دەکرد. کاتێك چاویان بەیەك کەوت، باوکی سەعید فریویدا و کوشتی و روویکردە شارەزوور و لەگەڵ رەبیعی کوردی، پەیمانی ئاشتی بەست و دژی خەلیفە راپەڕی.

لەم ساڵەدا موکتەفی بڕیاریدا کاری بیناسازی لەسامەرا دەست پێبکات. ئەو لەگەڵ پیشەگەرانی ئەم شارە بەرێکەوت و ئەوان خەرجی کارەکەیان خەملاند. ئەم خەرجییانە فراوان و ئەوان مانەوەی ئەویان لەو شارە درێژ کردەوە. وەزیر ئەم کارەی لەبەر چاوی موکتەفیدا گەورە کرد و ئەوی بۆ بەغداد گەڕاندەوە.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی عەبدولواحید کوڕی عەبدوللە کوڕی عوبەیدالله کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ حاجییەکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەلەوییە کوڕی عەبدوللە، فەقیهی شافعی جورجانی کەزانستی فیقهی لەعەلی موزنی هاورێی شافیعی فێربوو، هەروەها عەبدوللە کوڕی ئەحمەد کوڕی حەنبەل هەردووکیان مردن. عەبدوللە لەجومادی الاخرە/ مەی چاوی لێکان. ئەو لەساڵی ٨٢٨/٢١٣ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و یەکی کۆچی ( ٩٠٤ زایینی )

### بەسەرهاتی قەرەمتییەکان و کوژرانی خاڵدار

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەموکتەفی رووی کردە ڕەققە و سوپایەکی بۆ سەرکوت کردنی خاڵدار ڕەوانە کرد و محەممەد کوڕی سلێمانی کاتبی وەك فەرماندەی ئەم سوپایە دەستنیشان کرد. لەم ساڵەدا موکتەفی، فەرمانی بەمحەممەد کوڕی سلێماندا دژی خاڵدار بجەنگێت و محەممەد لەگەڵ سوپای خەلیفە بۆ جەنگی خاڵدار بەرێکەوت و لەشەشی موحەرەم/ سی نۆڤەمبەر لەشوێنێك کەدووری ئەوان و حەمات، دوانزە میل بوو، رووبەڕوویان بوویەوە. قەرەمتی سوپاکەی لەپێشەوە نارد و خۆی لەگەڵ ژمارەیەك لەسەربازەکانی مایەوە. ئەو، سامانەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو و سوپاکەی لەپشت سەرەوەی بەجێهێشتبوو. جەنگی نێوان سوپاکەی خەلیفە و قەرەمتییەکان پەرەی سەند و قەرەمتییەکان بەریسوایی شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ئەسیر کران و پاشماوەکەیان بۆ سارا هەڵاتن. سوپاکەی خەلیفە شوێنیان کەوتن.

کاتێك خاڵدار بینی چ بەڵایەك بەسەر سوپاکەیدا هاتووە، باوکی فەزڵی برای لەگەڵ سامانەکان بۆ سارا نارد و فەرمانی پێدا لەشوێنێك چاوەڕوانی هاتنی ئەو بێت. ئەو لەگەڵ کوڕە مامەکەی مودەسیر و هاورێکەی متوەق (مطوقق)، لەرێگەی بیابانەوە ڕێگەی کوفەیان گرتەبەر و گەیشتنە دالییە لەدەورووبەری فورات. توێشوو و ئالیکی ئەوان کۆتایی هات. یەکێك لەهاوەڵانی خۆی بەناوی کوڕی تەوق بۆ کرینی پێداویستییەکان ڕەوانە کرد. خەڵکانی دالییە گومانیان لەو پیاوە کرد و ئەو نهێنییەکەی خۆی پاراست. ئەویان بردە لای کارگوزای شارەکە بەنوێنەرایەتی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی کەشمەرد. ئەو، سەبارەت بەکار و مەبەستی ئەو پرسیاری کرد. کوڕی تەوق ئاگاداری کردەوە کەخاڵدار لەگەڵ سێ پیاو لەپشت تەپۆڵکەیەك خۆی حەشارداوە. کارگوزار بۆ گرتنی ئەوان بەرێکەوت و ئەوانی قۆلبەست کرد. ئەویان بۆ لای موکتەفی لەڕەققە نارد و سوپاییەکانیش دوای ئەوەی

ژمارەیەکی دیکەیان لەسوپای قەرەمتی کوشت، گەڕانەوە.

لەجەنگ لەگەڵ قەرەمتییەکان، حسەین کوڕی حەمدان، زیاتر لەهەموان هەوڵیدا و محەممەد کوڕی سلێمان نامەیەکی بۆ ئەو و منداڵەکانی شەیبان نووسی و دەسخۆشی لێکردن. ئەوان بوێرانە جەنگان و شکستیان بەقەرەمتییەکان هێنا و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و ئەسیر کردن و تەنیا ژمارەیەکی کەمی ئەوان رزگاری بوو.

لەرۆژی دووشەممە، بیست و شەشی موحەرەم/ بیست و دێسامبەر، خاڵداریان سوار وشترێك کرد و مودەسیر و متوەقیان سوار دوو وشتر کرد و لەبەرچاوی خەڵکان بەناو شارەکەدا ئەوانیان سوڕاند. موکتەفی لەگەڵ خاڵدار و هاوەڵانی رێگەی بەغدادی گرتەبەر بەڵام سوپاکەی ژێر فەرمانی محەممەد کوڕی سلێمان مایەوە. کاتی رۆشتنی ئەوان بۆ بەغداد، قەرەمتییان سوار فیل و هاورێکانیان سواری وشتر کرد. دواتر موکتەفی فەرمانیدا ئەوان زیندانی بکەن تا ئەو کاتەی محەممەد کوڕی سلێمان دەگات. موکتەفی دوای گەیشتن بەبەغداد مەبەستی دۆزینەوەی قەرەمتییەکانی کرد و ژمارەیەك لەگەورەکانی ئەوانی گرت. دواتر فەرمانیدا دەست و پێیان ببڕنەوە و دواتر سەری لەجەستە جیا کردنەوە. لەم کاتەدا خاڵدار و هاورێکانی لەزیندان هێنایەدەر و ئەو بەڵایەشی بەسەر ئەواندا هێنا. ئەو سەرەتا دووسەد قامچی لەخاڵداردا و فەرمانیدا هەردوو دەستی ببڕنەوە و داغی بکەن. خاڵدار لەهۆش چوو. دواتر بەدوو داری ئاگرین هەردوو کەلەکەیان سووتاند. خاڵدار لەم ئان و ساتەدا هەندێ کات چاوی دەکردەوە و هەندێ کات دەیبەست. کاتێك زانیان بەزوویی دەمرێت، سەریان بڕی و سەریان بەدارێکەوە کرد. خەڵکان تەکبیریان وت و سەری ئەویان لەسەر پردی بەغداد هەڵواسی.[٢٣]

لەم ساڵەدا پیاوێك لەمنداڵەکانی عولەیس یەکێك لەسەرکردەکانی قەرەمتی بەناوی ئیسماعیل کوڕی نوعمان دەرکەوت. ئەو تەنیا کەس لەناو سەرکردە قەرمتییەکان بوو کە لەجەنگ و کوشتار رزگاری بوو. موکتەفی نامەی بۆ نووسی و

[٢٣]– قەرمتی خاڵدار کە بەباوکی شامە یانی خاڵ، بەناوبانگە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد لەوەچەی ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادقە.

ئەمانی پێبەخشی. ئەو لەگەڵ سەد و شەست کەس بەئەمان نامەکەی موکتەفی رازی بوو. موکتەفی ڕێزی گرتن و خەلاتی پێبەخشین و ئەوانی بۆ سنووری فەرمانڕەوایەتی ڕەحبە کوڕی مالك کوڕی تەوق نارد تا شوێنکەوتەی قاسم کوڕی سیما بن. ئەم سنووره لەژێر فەرمانی قاسمدا بوو. قەرەمتییەکان چەند ڕۆژێکیان لای قاسم بەسەر برد و دواتر ئەندێشەی فرت و فێلیان لەسەردا پەروەردە کرد. بیریان لەوە کردەوە لەرۆژی جەژنی ڕەمەزان کاتی سەرقاڵ بوونی خەڵکان بەنوێژ، دژی قاسم ڕاپەڕن. دەستەیەکیش بۆ ئەم مەبەستە بەڵێنی هاوکارییان پێدابوون بەڵام قاسم لەمەبەستەکەیان ئاگادار بوویەوە و ئەوانی کوشتار کرد. بێ ئەوەی دەست بۆ کوشتنی موالییەکانی منداڵەکانی عولەیس درێژ بکات. ئەوانی لەسەماوە نیشتەجێ کرد تا ئەو کاتەی لەزەکرەویەی قەرەمتی نامەیەکیان بەدەست گەیشت کەنووسرا بوو وەحی بۆ من هاتۆتە خوار کەخاڵدار و شێخی برای کوژران و ئیمامی ئەو (کەزیندووە) دوای ئەو دوانە خۆی نیشان دەدات و سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەکەنارەکانی حوری و دەوروبەری (لەخوزستان) لافاوا هات و نزیکی سی فەرسەنگی وێران و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان خنکان. چوارپێ و دانەوێڵە لەژێر ئاودا نغرۆ بوون و گوندەکان خاپور و هەزار و دووسەد جەستەی بێ گیان لەکەنارەکان دۆزرایەوە جیاواز لەوکەسانەی هیچ کات جەنازەکەیان نەدۆزرایەوە.

لەم ساڵەدا موکتەفی بەمحەممەد کوڕی سلێمانی کاتب (فەرماندەی سوپا) و دەستەیەکە لەسەرکردەکان خەلاتی بەخشی و ئەوانی بۆ شام و میسر ڕەوانە کرد تا سنوری هارون کوڕی خەمارەویە وەربگرنەوە. چوونکە بۆ ئەم کارە ئەوی بەناتەوان دەبینی و ژمارەیەك لەجەنگاوەرەکانی ئەو لەجەنگ لەگەڵ قەرەمتییەکان گیانی خۆیان لەدەستدابوو. محەممەد کوڕی سلێمان لەمانگی ڕەجەب/ مەی لەگەڵ دە هەزار سوار بەخێرایی ڕێگەی شام و میسری گرتەبەر.

هەروەها لەم ساڵەدا تورکەکان بەسوپایەکی ئێجگار گەورە هێرشیان کردە سەر ماوەرائەلنەهر. لەئوردووگاکەی ئەوان تەنیا حەوتسەد بارەگا بۆ سەرکردەکان هەڵدەکرا. ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد سوپایەکی گەورەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد و ژمارەیەکی زۆر لەخۆبەخشەکان پەیوەستیان بوون و بۆ جەنگی تورکەکان بەڕێکەوتن و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەریان و تا بەرەبەیان لەسەرکوت کردنی ئەوان سەرقاڵ بوون. ژمارەیەکی نەخەملێنراویان لەوان کوشت. کەسانی دیکە هەڵاتن و ئوردووگاکەیان تاڵان کرا و موسوڵمانەکان لەگەڵ تاڵانییەکی فراوان و بێ هیچ زیانێك گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان لەگەڵ دە خاچ هێرشیان کردە سەر سنورە ئیسلامییەکان. لەژێر هەر خاچێك دە هەزار سەربازی ڕۆمی دەبینرا. دەستەیەك لەوان هێرشیان کردە سەر حەدەست و کوشتیان و بڕییان و تاڵانییان کرد و سوتاندیان.

لەم ساڵەدا پیاوێك بەناوی غولامی زەرافە لەتەرسوس ڕێگەی ڕۆمی گرتەبەر و دەستی بەسەر شاری ئەنتاکییەدا گرت. ئەم شارە هاوتای قوستەنتەنییە بوو. ئەو بەزۆری شمشێر ئەم شارەی گرت و پێنج هەزار کەسی کوشت و بەم ژمارەیە خەڵکی ئەسیر و پێنج هەزار ئەسیری موسوڵمانانی ئازاد کرد. شەست کەشتی وەك تاڵانی لەڕۆمییەکان سەند و کاڵا و سامانە تاڵان کراوەکانیان باری کەشتییەکان کرد. هەر سەربازێك لەسوپاکەی هەزار دیناری بەرکەوت. ئەم شارە لەکەنار دەریا بوو. موسوڵمانان لەم سەرکەوتنە شادمان بوون.

فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا قاسم کوڕی عوبەیداللە، وەزیری خەلیفە، لەمانگی زیقەعدە/ سێپتامبەر مرد. ساڵەکانی ژیانی سی و دوو ساڵ و حەوت مانگ و بیست و دوو ڕۆژ درێژەی کێشا. کاتێك مرد، کوڕی سەیار ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| امات ليحيى فما ان حيى | و افنى ليقى فما ان بقى |
| و ما زال فى كل يوم يرى | اماره حتف و شيك وحى |

و ما زال يسلح من دبره    الى ان خرى النفس فيما خرى

واتاکەی: ئەو کوشتی بۆ ئەوەی زیندوو بمێنێتەوە و لەناوی برد بۆ ئەوەی هەمیشەیی بێت بەڵام هەمیشەیی نەبوو. ئەو بەردەوام پیسایی لەدوای خۆیەوە فرێدەدا تا ئەو جێگەی نەفسی تێکەڵ بەپیسایی بوو.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی سەعید کوڕی عەبدولرەحمان ماستەوای، فەقیهی شاری نەیشابور مرد. محەممەد کوڕی محەممەدی جەزوعی، قازی موسڵ لەبەغداد، کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی یەحیای شەیبانی نەحوی، لەبەغداد مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و دووی کۆچی( ٩٠٥ زایینی )

چۆنیەتی زاڵبوونی موکتەفی لەشام و میسر و دارمانی فەرمانڕەوایەتی تولونی

لەموحەرەم/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە محەممەد کوڕی سلێمان بۆ جەنگی هارون کوڕی خەمارەویە کوڕی ئەحمەد کوڕی تولون هێرشی کردە سەر سنورەکانی میسر.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێک سلێمان لەموکتەفی بەجێما و موکتەفی لەجەنگی قەرەمتییەکان گەڕایەوە و محەممەد شوێنپێی ئەوانی هەڵگرت و کۆتایی بەکارەکەی خۆی هێنا و مەبەستی گەڕانەوە بۆ عێراقی کرد، لەبەدری حومامی، کۆیلەی کوڕی تولون نامەیەکی بەدەست گەیشت. محەممەد نامەیەکی دیکەی لەفائیقەوە بەدەست گەیشت. ئەم دوانە هەردووکیان لەدیمەشق بوون و پێشنیاری گرتنی شام و میسریان پێکرد و بەڵێنی هاوکارییان پێدا. کاتێک محەممەد گەیشتە بەغداد، موکتەفی لەنامەکانی ئەوان ئاگادار کردەوە. موکتەفی فەرمانی گەڕانەوەی پێدا و سوپایەکی بەتوێشوو و توانی پێویست کردە هاورێ. موکتەفی فەرمانی بەدەماینە، کۆیلەی بازماردا لەرێگەی دەریاوە خۆی بگەیێنێتە میسر و بڕواتە رووباری نیل ورێگە نەدات خواردەمەنی بگاتە ئەو سەرزەمینە. دەمیانە فەرمانەکەی ئەنجامدا و بارودۆخی لەمیسرییەکان دژوار کرد. محەممەد کوڕی سلێمان لەگەڵ سوپاکەی لەرێگەی وشکانییەوە هێرشی کردە سەریان. کاتێک لەمیسر نزیک کەوتەوە، نامەی بۆ سەرکردەکانی ئەو سەرزمینە نووسی. یەکەم سەرکردە کەوەڵامی دایەوە و پەیوەستی بوو، بەدری حومامی سەرکردەی فەرماندەکان بوو. ئەمە بووە هۆی لاوازی سەرکردەکانی میسر و ئەوان یەك لەدوای یەك پەیوەستی محەممەد کوڕی سلێمان دەبوون و داوای ئەمانیان دەکرد. کاتێک هارون ئەمەی بینی، لەگەڵ سوپاکەی بۆ جەنگی محەممەد کوڕی سلێمان هاتەدەر و لەنێوان ئەم دوو سوپایە چەندین جار جەنگ روویدا.

ڕۆژێك لەبەر دەمارگیری لەناو سوپاکەی هارون ئاژاوە کەوتەوە و بەجەنگی

یەکتر سەرقاڵ بوون. هارون هات و ئەوانی هێور کردەوە. لەم بگرە و بێنەدا پیاوێکی مەغریبی زوبینێکی بۆ هاویشت و گیانی گرت. کاتێك هارون کوژرا، شەیبانی مامی جلەوی کاروباری گرتەدەست و ڕۆژانەی سوپاکەیدا و ئەوان بۆ جەنگی محەممەد کوڕی سلێمان هاوکارییان کرد. لەم کاتەدا یەك لەدوای یەك نامەکانی بەدریان بەدەست دەگەیشت و دوای لێدەکردن لەسلێمان داوای ئەمان بکەن. ئەوان بەپێشنیارەکەی رازی بوون.

کاتێك محەممەد کوڕی سلێمان (لەپێشنیاری ئەمان و سستی) ئەوان ئاگادار بوویەوە، ڕۆشتە ناو میسر. لەم کاتەیشدا شەیبان داوای ئەمانی کرد و سلێمان پێی بەخشی. سلێمان بێ ئەوەی کەسی سوپاکەی ئاگادار ببێتەوە، شەوانە ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی سلێمان. بۆ بەیانی سەربازەکان مەبەستی ماڵەکەی ئەویان کرد بەڵام ئەویان نەبینی و سەرگەردان بوون. کاتێك محەممەد کوڕی سلێمان هاتە ناو میسر و دەستی بەسەر ماڵەکانی تولوندا گرت و سامانەکانی زەوت کرد، هەموو کەسانی بنەماڵەکەی (ژمارەیان حەڤدە کەس بوو) ئەسیر و قۆڵبەستی کردن. ئەم پێشهاتە لەمانگی سەفەر/ دێسامبر ڕوویدا.

ئەو هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بەموکتەفیدا و موکتەفی فەرمانی پێدا بنەماڵەی تولون وسامانەکانی ئەوان ڕەوانەی بەغداد بکات و کەسیان لەمیسر و، شام بەجێنەهێڵێت. محەممەد کوڕی سلێمان ئەو کارەی کرد و خۆی بۆ بەغداد گەڕایەوە و حکومەتی میسری بەعیسای نەوشەری سپارد.

دواتر پیاوێك لەمیسر دەرکەوت بەناوی خەلەنجی[٢٤]. ئەو یەکێك لەسەرکردەکانی بنەماڵەی تولون بوو کە لەدەستی محەممەد کوڕی سلێمان خۆی ڕزگار کرد. ئەو دەستەیەکی کۆکردەوە وریگەی ناسازگاری دژی خەلیفەی گرتەبەر. شوێنکەوتەکانی فراوان بوون و نەوشەری توانای جەنگی لەدەستدا و ڕووی کردە ئەسکەندەرییە. بەم شێوەیە ئیبراهیمی خەلەنجی ڕۆشتە ناو میسر و نەوشەری موکتەفی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. موکتەفی سوپایەکی بەفەرماندەیی فاتەك، موالی موعتەزید، و بەدر حومامی بۆ میسر ڕەوانە کرد و ئەوان لەشەوال/ ئۆگۆست، ڕێگەی میسریان گرتەبەر.

---

[٢٤]– لەمێژووی تەبەری بەخەلیجی ناوی هاتووە. (وەرگێڕ)

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەبەسرە پیاوێکیان گرت کەدەوترا مەبەستی شۆڕشی لەسەردایە. منداڵەکەی و سی و نۆ کەسی دیکەیشیان گرت و ڕەوانەی بەغدادیان کردن. ئەوان دەگریان و خوازیاری دادپەروەری بوون و خۆی بەبێ تاوان دەزانی. موکتەفی فەرمانی زیندانی کردنی ئەوانی دەرکرد.

لەم ساڵەدا ئەندرۆنەقسی ڕۆمی هێرشی کردە سەر مەرعەش و سەرزەمینەکانی دەوروبەری. دانیشتوانی مەسیسە و تەرسوس هێزیان کۆکردەوە و باوکی ڕەجال کوڕی باوکی بوکار لەگەڵ دەستەیەکی لەموسوڵمانەکان کوژران. خەلیفە باوکی عەشائیری لەفەرماندەیی سنورەکان دوورخستەوە و ڕۆستەم کوڕی بوردوای لەجێگەی ئەو دانیشاند.

لەم ساڵەدا ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان لەسەر دەستی ڕۆستەم ئەنجامدرا. ژمارەی ئەو موسوڵمانانەی لەم ئاڵوگۆڕەدا ڕزگاریان بوو گەیشتە هەزار و دووسەد کەس.

- فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس کوڕی محەممەد لەم ساڵەدا ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ حاجییەکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ئاوی دیجلە بەرز بوویەوە تا ئەو جێگەی ماڵەکانی نزیك ئەم ڕووبارە لەعێراق نغرۆ بوون.

لەبیستی مانگی ئەیار/ خوردادی ئەم ساڵە، ئەستێرەی کلکداری گەورە لەبورجی جەوزا بینرا.

لەم ساڵەدا لەباب ئەلتاق لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ڕێگەی مزگەرانی بەغداد، ئاگرێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند کەهەزار دوکانی پڕ کەل و پەلی کردە خۆراکی خۆی.

لەم ساڵەدا باوکی موسلیم ئیبراهیم کوڕی عەبدوللە کوڕی کەجی یا بەگومانێك کەشی، مرد.

لەم ساڵەدا قازی عەبدولحەمید کوڕی عەبدولعەزیز باوکی حازم، قازی موعتەزید باللە لەبەغداد، کە لەزاناترین و باشترینی قازییەکان بوو، مرد.

## رووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و سێی کۆچی ( ٩٠٦ زایینی )

**سەرەتای فەرمانڕەوایەتی منداڵەکانی حەمدان لەموسڵ و هەڵس و کەوتی ئەوان لەگەڵ کوردەکان**

لەم ساڵەدا موکتەفی باللە، موسڵ و ناوچەکانی دەوروبەری خستە ژێر فەرمانی باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان کوڕی حەمدونی تەغلەبی عەدەوی. باوکی هەیجا بەرەو موسڵ کەوتەرێ و لەسەرەتای موحەرەم/ دووی نۆڤەمبەر گەیشتە ئەو دیارە. ڕۆژێك لەوێ مایەوە و بەیانی ئەو ڕۆژە بۆ گەڕان لەناو ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەودا هاتبوون یا لەموسڵ مابوونەوە، هاتەدەر. لەم کاتەدا هاواری خەڵکانی نەینەوا بەرز بوویەوە کە لەکوردە هەزبانییەکان بێزاری خۆیان دەردەبڕی چوونکە کوردەکانی هەزبانییە بەسەرکردایەتی محەممەد کوڕی بیلال هێرشیان کردبووە سەر شارەکە و هەموو شتێکیان تاڵان و تاڵانی زۆریان کۆکردبوویەوە. ئەو، دەستبەجێ هێرشی کردە سەر نەینەوا و لەپردی ڕۆژهەڵات گوزەری کردو لەمەعرووبە، نزیك ڕۆژهەڵات، ڕووبەڕووی کوردەکان بوویەوە و جەنگی دەستپێکرد. لەم جەنگەدا یەکێك لەپیاوەکانی ئەو بەناوی سیما حەمدانی، کوژرا و بەم شێوەیە باوکی هەیجا گەڕایەوە و نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و داوای هاوکاری کرد. چەندین مانگ دواتر هێزە هاوکارییەکانی خەلیفە گەیشتن و ئەمە لەکاتێکدا بوو ساڵی ٢٩٣/٩٠٦ زایینی تێپەڕیبوو و ساڵی ٢٩٤/٩٠٧ زایینی دەستی پێکردبوو.

باوکی هەیجا لەرەبیع الاوەل/ دێسامبەری ئەم ساڵە لەگەڵ سوپاکەی، مەبەستی هێرش کردنە سەر کوردەکانی هەزبانییەی کرد. ئەوان لەگەڵ پێنج هەزار بنەماڵە کۆببوونەوە. کاتێك سووربوونی باوکی هەیجایان بۆ شوێنکەوتنی خۆیان بینی، بۆ بابە لەدۆڵی جەبەل ئەلسەلق، هەڵاتن. ئەوێ دۆڵێك لای چیایەکی بەرز لەسەرەوەی شارەزوور بوو. کوردەکان لەوێ سەنگەریان گرت و سەرکردەکەیان، محەممەد کوڕی بیلال هەڵات و خۆی لەباوکی هەیجا نزیك کردەوە و نامەیەکی بۆ کوڕی حەمدان نووسی و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشان دا و مەرجی کرد

خۆی و منداڵەکانی لای باوکی هەیجا بارمتە بن و بەم شێوەیە کوردەکان دەست لەشۆڕشەکەی خۆیان هەڵگرن. باوکی هەیجا رازی بوو. محەممەد گەڕایەوە تا بارمتەکان لەگەڵ خۆی ببات. ئەو هاوەڵانی خۆی ناچار کرد بەرەو ئازەربایەجان برۆن. محەممەد دەیویست بەفریودانی باوکی هەیجا چیتر رێگەنەدات شوێنپێی ئەوان هەڵگرن بۆ ئەوەی هاوەڵانی خۆیان بۆ کۆچ ئامادە بکەن و بەئاسوودەیی ملی رێگە بگرنەبەر.

کاتێك محەممەد لەگەڕانەوە، کەمتەرخەمی کرد، باوکی هەیجا لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ دەستەیەك و کەسانێك وەك براکانی سلێمان، داود و سەعید و پیاوە جەنگاوەر و بوێرەکانی دیکە، بەرێکەوت. فەرمانی هێرش کردنی بەهێزەکانی خەلیفەدا بەڵام ئەوان سستیان لەخۆیان نیشاندا. ئەوانی پشتگوێ خست و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی شوێن کوردەکان کەوت. کاتێك بەوان گەیشتەوە کەبەقەندیلدا هەڵدەگەڕان. ئەو دەستەیەك لەکوردەکانی کوشت بەڵام ئەوان خۆیان گەیاندە بەرزایی چیاکە و باوکی هەیجا دەستی لەشوێنکەوتنی ئەوان هەڵگرت و کوردەکان خۆیان گەیاندە ئازەربایەجان.

باوکی هەیجا بەسەرهاتی کوردەکان و سستی هێزەکانی خەلیفەی بەخەلیفە و وەزیر گەیاند و ئەوان سوپایەکی شیاویان بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد. باوکی هەیجا بۆ موسڵ گەڕایەوە و پیاوەکانی خۆی کۆکردەوە و رێگەی کێوەکانی ئەلسەلقی گرتەبەر. محەممەد کوڕی بیلال و کوردەکان لەسەر لوتکەی ئەم کێوە بوون. باوکی هەیجا هاتە ناو دۆڵەکە و لەترسی کەمین کردنی کوردەکان، سیخوڕەکانی لەپێشەوە نارد و خۆی لەگەڵ هاوەڵانی بەهێواشی رێگەیان دەبڕی. ئەوان لەچیاکە گوزەریان کرد و لەکوردەکان نزیك کەوتنەوە بەڵام لەم کاتەدا بەفر بارین دەستی پێکرد و سەرما تەنگی پێهەڵچنین و ئالیك و توێشوی سوپاکەی کەمی کرد. دە رۆژ بەم شێوەیە مانەوە. بەهای یەك بار کا (ئاڵف) بۆ سی دەرم بەرز بوویەوە. دواتر هیچ دەستنەدەکەوت بەڵام باوکی هەجیا بەهەمان شێوە لەسەر خۆڕاگری بەردەوام بوو.

کاتێك کوردەکان خۆڕاگری ئەویان بینی، و لەلایەکی دیکە، هیچ رێگە

چارەیەکی دیکەیان نەمابوو، محەممەد کوڕی بیلال و منداڵەکانی و کەسانی دیکە، ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی باوکی هەیجا دەربڕی. باوکی هەیجا دەستی بەسەر گەڕەك و بنەماڵە و سامانی ئەواندا گرت. ئەوان بەناچاری داوای ئەمانیان کرد و باوکی هەیجا ئەمانی پێبەخشین و لەکوشتاری ئەوان چاوی پۆشی و بۆ سنوری حەزە ئەوانی گەڕاندەوە و سامان و بنەماڵەکانی پێدانەوە. جگە لەیەك کەس، کەسی دیکەی نەکوشت. ئەم کەسە ئەوە بوو هاورێکەی ئەو سیمای حەمدانی کوشتبوو. بەم شێوەیە شارەکان ئەمن و باوکی هەیجا رێگەی چاکەکاری گرتەبەر.

دواتر محەممەد کوڕی بیلال داوای ئەمانی کرد و باوکی هەیجا پێیبەخشی و ئەوی هێنایە لای خۆی و لەموسڵ نیشتەجێی کرد. کوردەکانی حەمیدییە و دانیشتوانی کێوی داسن بەردەوام دەهاتنە لای باوکی هەیجا و داوای ئەمانیان دەکرد. بەم شێوەیە بارودۆخی شارەکان هێوەر بوویەوە.

## سەرکەوتن بەسەر خەلەنجی

لەسەفەر/ دێسامبەری ئەم ساڵە سوپاکەی موکتەفی لەمیسر نزیك کەوتەوە. ئەحمەد کوڕی کەیغلەغ لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان لەپێشەوە ڕۆشتن. خەلەنجی لەنزیك عورەیش ڕووبەڕوویان بوویەوە و شکستی بەکەیغلەغ هێنا.

دوای ئەو شکستە، دەستەیەك لەسەرکردەکانی بەغداد بۆ جەنگی میسر هەڵبژێردران و ئیبراهیم کوڕی کەیغلەغ لەناویاندا دەبینرا. سەرکردەکان لەرەبیع الاوەل/ ژانویەی رێگەی میسریان گرتەبەر.

هەواڵی هێز و توانایی خەلەنجی بەردەوام بەدەستیان دەگەیشت. موکتەفی خۆی تا دەروازەی شەماسییە هات بۆ ئەوەی بەرەو میسر بەرێکەوێت. ئەم پێشهاتە لەمانگی رەجەب/ ئاوریل ڕوویدا. یەك مانگ دواتر، نامەی فاتەك (لەفەرماندەکانی نیشتەجێی میسر) کە لەمانگی شەعبان، مەی نوسرابوو، بەدەستی موکتەفی گەیشت. لەم نامەدا هاتبوو کەدوای یەکەمین جەنگ(شکست) لەگەڵ سەرکردەکانی دیکە بۆ جەنگی خەلەنجی گەڕاوەتەوە و چەندین جەنگ لەنێوان ئەوان ڕوویداوە و

ژمارەیەکی فراوان لەهەردوولا کوژراون و لەدوایین جەنگ زۆرینەی سوپاکەی خەلەنجی لەخوێنی خۆیاندا گەوزاون و ئەوانی دیکە هەڵاتوون و دەستیان بەسەر ئوردووگاکەی خەلەنجیدا گرتووە و خۆی هەڵاتووە و ڕێگەی فوسفاتی میسری گرتۆتەبەر و لای یەکێك لەدانیشتوانی ئەو دیارە خۆی حەشارداوە. ئێمە ڕۆشتینە ناو شارەکە و قۆڵبەستمان کرد و هەنووکە ئەم دوانە لەزینداندا ژیان بەسەر دەبەن.

موکتەفی فەرمانێکی بۆ فاتەك نووسی تا خەلەنجی و هاورێکەی ڕەوانەی بەغداد بکات. بەم شێوەیە موکتەفی بۆ بەغداد گەڕایەوە و فەرمانیدا سامانەکان بگەڕێنەوە. سامانەکان لەم کاتەدا گەیشتبووە تکریت. فاتەك، خەلەنجی بۆ بەغداد نارد و ئەو و هاورێکەی لەرەمەزان/ جون گەیشتنە بەغداد و موکتەفی فەرمانی زیندانی کردنی ئەوانی دەرکرد.

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا زەکرەویە کوڕی مەهرەویە دوای کوژرانی خاڵدار، پیاوێکی بۆ دەوروبەری قەلوجە نارد کەدەرسی فێری منالان دەکرد. ئەو عەبدوللە کوڕی سەعید بەنازناوی باوکی غانەم بوو و دواتر ناوی خۆینا نەسر. دەستەیەك وتوویانە کوڕی زەکرویە ئەوی نارد. ئەو بەناو هۆزەکانی عەرەب لەمناڵەکانی کەلاب و ئەوانی دیکە دەگەڕا و بانگەوازەکەی خۆی بڵاو دەکردەوە. کەس گرنگی پێنەدا مەگەر پیاوێك لەمناڵەکانی زیاد بەناوی میقدام کوڕی مەکیال. مەکیال، چەندین تایەفە لەئەسبەغییەکانی موالی فەواتیم و کەسە کەم بەهاکان و سەرسەرییەکانی لەهۆزەکانی دیکەی کەلب بۆ هاوکاری کردنی نەسر گومڕا کرد. نەسر مەبەستی شامی کرد. لەم کاتەدا فەرمانڕەوای دیمەشق و ئەردەن ئەحمەد کوڕی کەیغلەغ بوو کە لەمیسر جەنگی لەگەڵ خەلەنجی دەکرد. عەبدوللە کوڕی سەعید (یا هەمان نەسر) ئەم دەرفەتەی بەهەل زانی و ڕووی کردە بوسری و ئەزرەعات و بەسنییە و لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچانە جەنگا و دواتر ئەمانی پێبەخشین و کاتێك ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشاندا، شەرکەرانی ئەوانی کوشت و ژن و منالەکانی ئەسیر و سامانەکانی بەتالانی برد.

دواتر بەرەو دیمەشق کەوتەرێ. نوێنەری کەیغلەغ، سالح کوڕی فەزڵ بۆ جەنگی ئەوان هاتەدەر بەلاَم قەرەمتییەکان شکستیاندا و ژمارەیەکی بەرچاویان لەوان کوشت. قەرەمتییەکان ڕێگەی فرت و فێڵیان گرتەبەر و ئەمانیان پێبەخشین و دواتر سالحیان کوشت و بلاَوەیان بەسوپاکەی کرد. ڕێگەی دیمەشقیان گرتەبەر. دانیشتوانی شارەکە ڕووبەڕوویان بوونەوە. لەم کاتەدا قەرەمتییەکان هێرشیان کردە سەر تەبەرییە و دەستەیەك لەسوپای دیمەشق کەفریویان خواردبوو، هاوڕێیەتی سوپای قرەمتییان دەکرد. یوسف کوڕی ئیبراهیم کوڕی بوغامەردی، جێگری ئەحمەد کوڕی کەیغلەغ لەئەردەن ڕووبەڕووی قەرەمتییەکان بوویەوە بەلاَم قەرەمتییەکان سوپاکەی ئەویشان تێکشکاند وئەمانیان پێبەخشی و یوسفیان کوشت و تەبەرییەیان تالاَن و ژمارەیەکی زۆر دانیشتوانەکەیان کوشتار و ژنەکانیان ئەسیر کرد.

خەلیفە، حسەین کوڕی حەمدانی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەم دەستەیە هاتنە ناو دیمەشق بەلاَم کاتێك قەرەمتییەکان لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوونەوە، بەرەو سەماوە گەڕانەوە. حسەین کوڕی حەمەدان شوێنپێی ئەوانی هەڵگرت و ئەوان لەئاوێك بۆ ئاوێکی دیکە دەڕۆشتن و بەگوزەر کردن لەهەر ئاوێك، کوێریان (پڕیان) دەکردەوە تا دوژمن نەتوانێت سوودی لێ ببینێت تا ئەوەی گەیشتنە دوو ئاوی دەمعانە و حەبالە و حسەین کوڕی حەمدان دەستی لەوان شۆرد چوونکە ئاویان پێنەمابوو و بەناچاری بۆ ڕەحبە گەڕانەوە. قەرەمتییەکان لەگەڵ نەسر بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەر هەیت و کەنارەکانیان تالاَن کرد بەلاَم دانیشتوانی ئەم شارە دیواری شارەکەی خۆیان پاراست. قەرەمتییەکان دەستیان بەسەر کەشتییەکاندا گرت و دووسەد کەس لەشارۆمەندانی ئەو شارەیان کوشت و بڕێکی زۆر سامان و کالاَیان فڕاند و سێ هەزار سەر چوارپێ گەنمیان بار کرد و ڕۆشتن.

هەواڵی ئەم تالاَن و برەوە بەموکتەفی گەیشت و ئەو محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیقی بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد. بەلاَم قەرەمتییەکان لەبەرابەر محەممەد خۆڕاگرییان نەکرد وبۆ دوو ئاوەکە گەڕانەوە. محەممەد شوێنپێی ئەوانی هەڵگرت

بەڵام بینی ئاوەکان کوێر کراونەتەوە. لەبەغدادەوە ئاو و خواردەمەنی بۆ نێردرا. بۆ حسەین کوڕی حەمدان نامەیەك نووسرا تا لەرەحبەوە پەیوەستیان ببێت بۆ ئەوەی لەگەڵ محەممەد بۆ جەنگی قەرەمتییەکان خۆیان ئامادە بکەن. حسەین بەرێکەوت.

کاتێك مناڵەکانی کەلب، سوپاکەی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کونداجیقیان بینی، دژی ئەسر راپەڕین و گیانیان گرت. پیاوێك بەناوی زەئب کوڕی قائیم ئەوی کوشت. سەری ئەویان بۆ رازی کردنی موکتەفی، بۆ بەغداد نارد و لەبری ئەوە داوای بەخشینی ئەمان بەخەڵکانیان کرد. موکتەفی ئەمانی پێبەخشین و پاداشێکی گرانبایی پێدان و فەرمانیدا دەست لەجەنگ لەگەڵ خەڵکانی زەئب هەڵگرن.

قەرەمتییەکان دوای ئەسر لەناو خۆیاندا ناسازگار و گرفتاری شەڕی نێوخۆیی بوون. دەستەیەك لەوان کەئەم کارەیان پەسەند نەدەکرد، بۆ لای مناڵەکانی ئەسەد لەکەنارەکانی عەین ئەلتەمەر (نزیك کەربەلا) ڕۆشتن و داوای بەخشینیان لەخەلیفە کرد. خەلیفە ئەوانی بەخشی و پاشماوەی ئەوان کە لەسەر باوەڕەکەی خۆیان سوور بوون، لەدوو ئاو مانەوە. خەلیفە فەرمانی بۆ کوڕی حەمدانی نووسی تا جەنگ دژی ئەوان دەستپێبکات و لەڕەگ و ریشەوە لەناویان ببات. زەکرەویە کوڕی مەهرەویە (سەرکردە و رێبەری قەرەمتییەکان) بانگەوازکەرێکی دیکەی بۆ لای قەرەمتییەکان نارد بەناوی قاسم کوڕی ئەحمەد ناسراو بەباوکی محەممەد. ئەو وتی کاتی سەرکەوتنی قەرەمتییەکان هاتووە. چل هەزار کەس لەخەڵکانی کوفە بەیعەتیان لەگەڵ باوکی محەممەد کرد. ئەوان رۆژی کۆبوونەوەیان لەو رۆژەدا دیاری کرد کەخواوەند لەقورئاندا و لەگێڕانەوەی داستانی موسا و فیرعەون ئاماژەی پێداوە و دەفەرمێت: ((وتی: کاتی کۆبوونەوەی ئێوە رۆژی خۆ جوان کردنە کەخەڵکان لەنیمەڕۆدا کۆدەبنەوە))[٢٥] زەکرەویە فەرمانی پێدان بارودۆخی خۆیان بەنهێنی بهێڵنەوە .وپێشڕەوی بکەن تا لەرۆژی جەژنی قوربان (دەی زیحەججە)ی ساڵی ٩٠٦/٢٩٣ زایینی دەڕۆنە ناو کوفە چوونکە کەس نابێتە رێگر

[٢٥]- قال موعدکم یوم الزینة و ان یحشر الناس ضحی. (طه/ ٥٩)

لەچوونە ناوەوەی ئەوان بۆ شارەکە. لەوێ زەکرەویە خۆیان نیشان دەدات و بەڵێنەکانی خۆی دێنێتەدی. فەرمانی بەواندابوو قاسم کوڕی ئەحمەد لەگەڵ خۆیان بێنن.

ئەوان فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ کرد و کاتێك گەیشتنە دەروازەی کوفە کەخەڵکان لەنوێژی ڕۆژی جەژنی قوربان دەگەڕانەوە. فەرمانڕەوای کوفە ئیسحاق کوڕی عیمران بوو. قەرەمتییەکان لەگەڵ هەشسەد سواری زرێپۆش و کەرەستەی جەنگی پێویست، ڕۆشتنە ناو کوفە و بۆ قاسم کوڕی ئەحمەد خێوەتێکیان هەڵدا. ئەوان دەیانوت: ئەمە یادگاری پێغەمبەرە (د.خ) و هاواریان دەکرد: دەبێت تۆڵەی خوێنی حسەین بکرێتەوە. مەبەستی ئەوان لەحسەین، حسەین کوڕی زەکرەویە بوو کە لەبەغداد لەدار درا. ئەمە دروشمەکەیان بوو: یا ئەحمەد! یا محەممەد! کەهەمان دوو کوڕە کوژراوەکەی زەکرەویە بوون. ئەوان ئاڵا سپییەکانی خۆیان نیشاندا و بەم شێوەیە دەیانویست دڵی خەڵکانی کوفە بەدەست بێنن بەڵام کەس شوێنیان نەکەوت. لەبەر ئەمە قەرەمتییەکان ڕێگەیان لەخەڵکانی کوفە دەگرت و نزیکەی بیست کەسیان کوشت.

خەڵکانی کوفە کەرەستەی جەنگیان هەڵگرت. ئیسحاق ئامادەیی خۆی نیشاندا. سەد سواری قەرەمتی ڕۆشتنە ناو شارەکە و بیست کەسیان کوژران و ئەوانی دیکە لەکوفە دوورخرانەوە. ئیسحاق تا نیمەڕۆ درێژەی بەجەنگدا. لەم کاتەدا ئەوان ڕێگەی قادسیەیان گرتەبەر. دەستەیەك لەتالبییەکان (بنەماڵەی باوکی تالیب) شان بەشانی ئیسحاق دژی ئەوان دەجەنگان.

ئیسحاق نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. خەلیفە سوپایەکی بۆ هاوکاری ئەو نارد. ئەم سەرکردانە لەناویاندا دەبینران: وەسیف کوڕی سەوارتەکینی تورك، فەزڵ کوڕی موسا کبوغا، بیشر، خادمی ئەفشین، رائیقی حەرەمی موالی سەروەری باوەڕداران و دەستەیەك لەکۆیلەکانی حەجەرییە. ئەوان لەنیوەی زیحەجە/ هەشتی نۆڤەمبەر بەرێکەوتن و لەقادسیە نزیك کەوتنەوە و لەسەوان ئوردوویان لێدا. لێرەدا زەکرەویە ڕووبەڕوویان بوویەوە.

لەم کاتەدا قەرەمتییەکان پەیکیان نارد تا زەکرویە کەچەندین ساڵ لەچاڵێك

لەگوندی دەریە ژیانی بەسەر دەبرد، بێننەدەر. لەسەر ئەم چاڵە دەرگایەکی ئاسنین جێگیر کرابوو. زەکرویە هەرکاتێك ترسی شوێنکەوتنی لا دروست دەبوو، لەسەر ئەم دەرگایە تەنورێکی سور دەکردەوە و ژنێکی رادەسپارد تا تەنوورەکە داگیرسێنێت و چیتر کەس گومانی لەشوێنەکەی ئەو نەدەکرد. ئەو هەندێ کات لەماڵێك خۆی دەشاردەوە کەژوورێك لەتەنیشت دەرگاکەیەوە دروست کرابوو و هەرکات دەرگای ماڵەکە دەکرایەوە، تایەکی دەرگاکە دەکەوتە سەر دەرگای ژوورەکەی ئەو و ئەو کەسەی دەهاتە ژوور، هەستی بەم دەرگایە نەدەکرد. کاتێك قەرەمتییەکان زەکرەویەیان هێنایەدەر، خستیانە سەردەست و بەوەلی الله ناویان برد. کاتێك ئەویان بینی، سەریان لەخاك سوو. دەستەیەك لەبانگەوازکەران و کەسە نزیکەکان هاتنە لای. ئەوانی ئاگادار کردەوە کەقاسم کوڕی ئەحمەد زیاتر لەهەموو خەڵکان چاکەی لەگەڵ کردووە و ئەو، ئەوانەی لەدین هەڵگەڕابوونەوە، دووبارە بۆ باوەڕداربوون بەم دینە گەڕاندەوە و ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بن، بەڵێنەکانی دێنێتەدی و بەئارەزووەکانیان دەگەن. ئەو چەندین نیشانەی بۆ ئەوان دیاریکرد و لەم نیشانانە پشتی بەچەندین ئایەی قورئان بەست. هەرکەس لەدڵیدا کوفر جێگیر ببوو، باوەڕی هێنا کەئەو پێشەوا و پەناگەی ئەوانە. بەم شێوەیە قەرەمتییەکان لەسەرکەوتن و گەیشتن بەئامانج و ئارەزووەکانیان دڵنیا بوون.

زەکرویە ئەوانی برد و خۆی حەشاردا و ئەوانیش شوێنی ئەویان ئاشکرا نەدەکرد و بەسەروەر ناویان دەبرد. جڵەوی کاروبارەکان لەدەستی قاسمدا بوو. زەکرویە پێی وتن کەهەموو خەڵکانی دەوروبەری عێراق لەگەڵ ئێوەدان. ئەوان چەند رۆژێك لای فورات مانەوە و جگە لەپێنسەد کەس، کەس پەیوەستیان نەبوو. دواتر سوپای ڕەوانە کراو لەلایەن خەلیفە گەیشت و زەکرویە لەسەوان رووبەرروویان بوویەوە و ئاگری شەڕێکی قورس بڵێسەی سەند. لەسەرەتای رۆژ قەرەمتییەکان شکستیان خوارد بەڵام زەکرویە لەپشت سەری ئەوان بۆسەی نابوویەوە بێ ئەوەی سوپاکەی خەلیفە ئاگاداری بن. لەناکاو شمشێر لەپشتەوە بەسەریاندا باری و بەم شێوەیە سوپاکەی خەلیفە بەریسوایی شکستی خوارد و

قەرەمتییەکان بێ ئەمان کوشتاریان دەکردن و ئۆردووگاکەیان تالان کرد. لەسوپاکەی خەلیفە کەس رزگاری نەبوو مەگەر ئەو کەسەی چوارپێکەی بەهێز یا ئەوەی بریندار و خۆی لەناو کوژراوەکاندا شاردەوە. ئەوان جارێکی دیکە هێرشیان برد و لەئوردووگاکەی خەلیفە سێسەد وشتریان بەکەل و پەلی جەنگ و پێنسەد ئێستریان وەك تالانی دەستکەوت. جگە لەکۆیلەکان، هەزار و پێنسەد سەربازیان کوشت. بەم تالانییە، پێگەی قەرەمتییەکان بەرز بوویەوە.

کاتێك هەواڵی ئەم جەنگە گەیشتە بەغداد، خەلیفە و خەڵکان بەدژواریان زانی. خەلیفە، محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی کەنداجی بۆ جەنگ لەگەڵ قەرەمتییەکان بانگ کرد و عەرەبەکانی منالەکانی شەیبان و کەسانی دیکەی کردە هاوڕێ. ژمارەی ئەوان گەیشتە دوو هەزار جەنگاوەر. خەلیفە مانگانەی بەهەموویاندا. زەکرویە لەبەر بۆگەن کردنی جەنازەی کوژراوەکان، لەوێ ڕۆشت و ڕێگەی رووباری مەسنییەی گرتەبەر.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەرەبیع الاخر/ ژانویەی ئەم ساڵە یەکێك لەسەرکردەکانی تاهیر کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی لەیس، ناسراو بەباوکی قابوس هاتە بەغداد و داوای ئەمانی کرد.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوەبوو: تاهیر سەرقاڵی خوشگوزەرانی و ڕاو بوو و بۆ ئەم مەبەستە رووی کردە سەجستان و لەیست کوڕی عەلی کوڕی لەیس و سەبکەری، موالی عەمرۆ کوڕی لەیس، دەستیان بەسەر فارسدا گرت و لەنێوان ئەم دووانە و ئەو سەرکردەیە دووری هاتە ئاراوە و لەوان خۆی بەدوور گرت و خۆی گەیاندە بەغداد. خەلیفە خەلاتی پێبەخشی و ڕێزی گرت. تاهیر کوڕی محەممەد نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و داوای لێکرد باوکی قابوس بگەڕێنێتەوە. ئەو لەم نامەدا نووسی کەباوکی قابوس باجی کۆکردۆتەوە و هاتۆتە بەغداد. لەنامەکەیدا نووسی: یا ئەو دەگەڕێنیتەوە یا ئەو سامانەی ئەو هێناویەتی، دەخەیتە بری ئەو سامانەی دەبێت من ڕەوانەی بەغدادی بکەم. خەلیفە وەڵامی نامەکەی نەدایەوە.

لەم ساڵەدا بانگەوازکەری قەرەمتییەکان لەیەمەنەوە ڕۆشتە سەنعا و لەگەڵ دانیشتوانی ئەو سەرزەمینە جەنگی و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و کوشتاری کرد و جگە لەژمارەیەکی کەم کەس رزگاری نەبوو. ئەو دەستی بەسەر کەنارەکانی دیکەی یەمەندا گرت. دواتر خەڵکانی سەنعا و شوێنەکانی دیکە کۆبوونەوە و لەگەڵ بانگەوازکەری قەرەمتییەکان جەنگان و شکستیان پێهێنا. ئەو بۆ یەکێك لەکەنارەکانی یەمەن هەلات. خەلیفە لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە. خەلیفە لەشەوال/ جولای خەلاتی بەموزەفەر کوڕی حاج بەخشی وفەرمانڕەوایەتی یەمەنی پێسپارد و ئەوی بۆ جەنگی قەرەمتی ڕەوانە کرد. موزەفەر ڕۆشتە یەمەن و لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی مرد.

لەم ساڵەدا رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر قوروس لەکەنارەکانی حەلەب. دانیشتوانەکەی سەرسەختانە خۆڕاگرییان کرد بەلام شکستیان خوارد و زۆرینەی ئەوان کوژران و رۆمییەکان گەورەی منالەکانی تەمیمیان کوشت و ڕۆشتنە ناو قوروس و مزگەوتی هەینیان سووتاند و زیندووەکانیان لەگەڵ خۆیان برد.

لەم ساڵەدا ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی فەرمانڕەوای ماوەرا ئەلنەهر دەستی بەسەر چەند ناوچەیەك لەسەرزەمینی تورکان و دەیلەمییەکاندا گرت.

محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی ئەحمەدی حافز لەمانگی ڕەمەزان/ جون و باوکی عەباس عەبدوللە کوڕی محەممەدی شاشی، وتارخوێن و کاتبی ئەنباری هەردووکیان مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و چوار کۆچی ( ٩٠٧ زایینی )

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان و تاڵانکاری ئەوان لەناو حاجییەکان

لەموحەرەم/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە زەکرویە لەکەنار ڕووباری مەسنیە مەبەستی حاجییەکانی کرد و گەیشتە سەلمان و لەوێ مایەوە و چاوەڕوانی هاتنی حاجییەکان بوو. یەکەم کاروانی حاجییەکان لەحەوتی موحەرەم/ بیست و نۆی ئۆکتۆبەری گەیشتە واقسە. دانیشتوانی واقسە ئەوانیان ئاگادار کردەوە و لەنزیک بوونی قەرەمتییەکان لەو ناوچەیە هۆشدارییان پێدان و حاجییەکان دەستبەجێ گەڕانەوە.

قەرەمتییەکان بۆ واقسە گەڕانەوە و لەدانیشتوانی ئەو ناوچە سەبارەت بەحاجییەکان پرسیاریان کرد. ئەوان وتیان حاجییەکان گەڕاونەتەوە. زەکرویە گومانی لەوان کرد و فەرمانی کوشتاری چوارپێکانی ئەوانیدا و ئالیکەکانی سووتاند. خەڵکانی واقوسە خۆیان حەشاردا. قەرەمتییەکان چەند ڕۆژێك ئەوانیان ناکاوگیر کرد و دواتر ئەوانیان بەجێهێشت و ڕوویان کردە زوبالە و لەرێگە دەستەیەك لەمناڵەکانی ئەسەدیان تالآن کرد.

سوپای ڕەوانە کراو لەبەغداد گەیشتە سەرچاوەکانی تەف. ئاگادار بوونەوە کەزەکرویە لەسەلمانە. عەلان کوڕی کەشمەرد ئەسپی غاردا و بەرەو واقوسە بەرێکەوت و دوای گوزەر کردن لەیەکەم کاروانی حاجییەکان گەیشتە ئەو دەڤەرە. لەم کاتەدا زەکرویەی قەرەمتی لەگەردەنەی شەیتان ڕووبەڕووی کاروانی خوراسانییەکان بوویەوە کە لەمەککە دەگەڕانەوە. مەبەستی جەنگی کرد و کاتێك پێداگری و سوور بوونی ئەوانی بۆ جەنگ بینی، پرسی: ئایا خەلیفە لەناو ئێوەدا نوێنەری هەیە؟ ئەوان وتیان: کەس لەگەڵ ئێمەدا نییە. زەکرویە وتی: چیتر نامەوێت لەگەڵ ئێوە بجەنگم. بێ ترس و دڵەڕاوکێ درێژە بەرێگەی خۆتان بدەن. و کاتێك بەرێکەوتن بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشی کردە سەریان و لەناوی بردن. تەنیا ئەوانەی هەڵاتن، ڕزگاریان بوو. ئەو ژنانەیان ئەسیر کرد

کەدەیانخواست و ئەو ژنانەی نەیاندەویست خوێنیان ڕژا.

دەستەیەك لەهەڵاتووان چاویان لەعەلان کوڕی کەشمەرد کەوت و لەم پێشهاتە ئاگاداریان کردەوە و پێیان وت دووری نێوان تۆ و ئەوان زۆر نییە و ئەگەر کاروانییەکان ئێوە ببینن، ورەیان بەرز دەبێتەوە و خۆڕاگر دەبن (بەڵام هەموویان کوژرابوون و هەڵاتوان نەیاندەزانی.) عەلان وتی: سوپاکەی خەلیفە بەکوشتن نادەم. لەگەڵ هاوەڵانی گەڕایەوە.

حاجییە رزگاربووەکان بۆ پێشەنگەکانی کاروانی سێیەم نامەیەکیان نووسی و لەبەسەرهاتی خۆیان لەگەڵ قەرەمتییەکان ئەوانیان ئاگادار کردەوە و داوایان لێکردن لەرێگەکان خۆیان بەدوور بگرن و رێگەی واست و بەسرە بگرنەبەر یا بۆ فید و مەدینە بگەڕێنەوە تا سوپاکەی خەلیفە بگات. بەڵام کاروانی سێیەم گرنگییان بەوتەکانی ئەوان نەدا و چاوەڕوانی هاتنی سوپایان نەکرد.

قەرەمتییەکان دوای تاڵان کردنی حاجییەکان گەردەنەیان بەجێهێشت و هەموو ئاو و چاڵاوەکانی واقسە، سەعلەبییە و گەردەنەکەیان بەبەرد و خۆڵ کوێر کردەوە. زەکرویە لەهەیبەر چاوەڕوانی هاتنی کاورانی سێیەم بوو. لەکاتی ڕۆشتندا رووبەرووی ئەم کاروانە بوونەوە و زەکرویە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەگەڵ ئەوان جەنگی. حاجییەکان لەبەر نەبوونی ئاو تەسلیم بوون و زەکرویە شمشێری خستە ناویان و هەموویانی کوشت و تەپۆڵکەیەکی لەکوژراوەکان دروست کرد. ئەو کەسی بەدوای ھەڵاتواندا نارد و ئەمانی پێبەخشین. بەڵام کاتێك گەڕانەوە، ئەوانی کوشت. موبارەکی قەمیی و منداڵەکەی باوکی عەشائیر کوڕی حەمدان لەناو کوژراوەکاندا دەبینران.

ژنە قەرەمتییەکان لەناو کوژراوەکاندا ئاویان دەگێڕا و هەرکەس قسەی دەکرد یا داوای ئاوی دەکرد، دەیانکوشت. دەڵێن ژمارەی کوژراوەکانی ئەم جەنگە نزیکەی بیست هەزار کەس بوو. تەنیا ئەو کەسانە رزگاریان بوو کە لەناو کوژراوەکاندا خۆیان وەك مردوو نیشاندا و کەس هەستی بەزیندوو بوونی ئەوان نەکرد و دواتر خۆیان نەجاتدا. ئەو کەسانەی لەم جەنگەدا کوژران زیاتر لەوانە بوو کۆیلە کران یا زیندوو مانەوە. قەرەمتییەکان نزیکەی دوو هەزار هەزار

دیناریان لەم کاروانە دەستکەوت.

یەکێك لەو شتانەی قەرەمتییەکان تالأنییان کرد، سامان و کالأکانی تولونییەکان (فەرمانڕەواکانی میسر) بوو. تولونییەکان کاتێك مەبەستی جێگۆڕکێ بۆ بەغدادیان کرد، لەترسی ئەوەی دەست بەسەر زێڕ و زیوەکانیان نەگرت، هەموویان کردە شمش و لەناو کۆپانی وشترەکان شاردیانەوە و بەشێوەیەکی نهێنی ڕەوانەی مەککەیان کرد و لەگەڵ ئەم کاروانەدا کە لەمەککە دەگەڕانەوە، کەوتە دەستی قەرەمتییەکان.

زەکرویە لەترسی سوپای خەلیفە لەقادسیە، پێشەنگەکانی خۆی نارد و چاوەڕوانی کرد تا ئەو دەستە لەسوپای خەلیفەن کەهاورێیەتی حاجییەکانیان دەکرد، لەرێگەوە بێن. سوپاکەی خەلیفە لەفید نیگەران بوون ئایا قەرەمتییەکان هێرش دەکەنە سەر حاجییەکان یا نە. دەستەیەك لەبازرگانەن دەوڵەمەندەکان هاورێیەتی ئەوانیان دەکرد. کاتێك لەکوشت و کوشتاری قەرەمتیەکان ئاگادار بوونەوە، چاوەڕوانی هاتنی سوپاکەی خەلیفەیان دەکرد کەزەکرویە هێرشی کردە سەریان و دووبارە چالأوەکانی کوێر کرد و کانییەکانی تا فیدی لەناو برد. قەرەمتییەکان گەمارۆیان خستە سەر دانیشتوانی فید. زەکرویە کەسێکی بۆ لای دانیشتوانی فید نارد و فەرمانی پێدان ئەوانەی خۆیان لەو شارەدا حەشارداوە، بەو بسپێرن و ئەمانی پێبەخشین بەلأم خەڵکانی فید رازی نەبوون. زەکرویە ئەوانی ترساند کەدەست بۆ کوشتن و تالأن کردنی ئەوان درێژ دەکات بەلأم ئەمە بووە هۆی سوور بوون و خۆڕاگری خەڵکانی فید. زەکرویە چەند رۆژێك چاوەڕوان بوو و دواتر رووی کردە ساج و دوای ئەوێ بۆ لای جەعفەر کوڕی باوکی موسا ڕۆشت.[٢٦]

---

[٢٦]– ئەم چەند دێرەی دوایی وەك لەخودی کتێبە سەرەکییەکەدا ئاماژەی پێدراوە، بەتەواوی روون و ئاشکرا نییە. (وەرگێڕ)

## چۆنیەتی کوژرانی زەکرویەی نفرین کراو

کاتێك زەکرویە ئەو بەڵایەی بەسەر حاجییەکاندا هێنا، خەلیفە تورە بوو و موسوڵمانانیش بەهەمان شێوە. موکتەفی سوپای رازاندەوە و لەسەرەتای رەبیع الاوەل/ بیستی دێسامبەر، وەسیف کوڕی سەوارتەکینی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردە و سوپاییەکان بۆ جەنگی قەرەمتییەکان ڕەوانە کرد. ئەوان لەرێگەی حێفانەوە هاتن و لەهەشتی رەبیع الاوەل/ بیست و هەشتی دێسامبەر لەگەڵ زەکرویە و قەرەمتییەکان رووبەروو بوونەوە و ئەو رۆژەیان بەجەنگ بەسەر برد و شەو، جیایی لەنێوان دوو سوپاکە دروست کرد. هەرکام لەم دوو سوپایەی، شەویان بەکێشك گرتن کردە رۆژە و بەرەبەیان جەنگیان دەست پێکردەوە و شەڕێکی قورس و مەترسیدار بڵێسەی سەند و ژمارەیەکی زۆر لەقەرەمتییەکان کوژران. سوپاکەی خەلیفە گەیشتە دوژمنەکەی، زەکرویە و یەکێك لەسەربازەکان شمشێرەکەی خۆی بەسەر سەری ئەودا باراند لەکاتێکدا دەیویست لەگۆڕەپانی جەنگ رابکات. ئەم گورزە سەری ئەوی بریندار کرد. سەربازێکی دیکە ئەسیری کرد و جێگر و کەسە نزیکەکانیشی ئەسیر کران. کوڕ، کاتب و هاوسەری زەکرویە لەناو گرفتارەکان دەبینران. سوپاکەی خەلیفە ئوردووگاکەی زەکرویەیان تاڵان کرد.

زەکرویە چەند رۆژێك زیندوو مایەوە و دواتر مرد. جەنازەی ئەویان لەگەڵ ئەسیرەکان ڕەوانەی بەغداد کرد. دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەو بۆ شام هەڵاتن. لەوێ حسەین کوڕی حەمدان ئەوانی گرت و هەموویانی کوشتار کرد. دەستەیەك لەژن و منداڵە قەرەمتییەکان ئەسیر کران. سەری زەکرویە بۆ خوراسان ڕەوانە کرا تا حاجییەکان لەڕۆشتن بۆ ماڵی خواوەند، نەترسن. عەرەبەکان دووان لەهاوەڵانی زەکرویەیان گرت یەکیان بەناوی حەداد و ئەوی دیکەیان ژن برای زەکرویە بوو بەناوی مونتەقیم. ئەوان هاتبوون تا خەڵکان بۆ شۆڕش هانبدەن. عەرەبەکان ئەو دووانەیان ڕەوانەی بەغداد کرد. خەلیفە شوێنپێی قەرەمتییەکانی لەعێراق هەڵگرت و ژمارەیەکی لەوان کوشت و ژمارەیەکی ئەسیر کرد و ژمارەیەك

لەزیندانەکاندا مردن.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا کوڕی کەیغەلەغ لەتەرسوس هێرشی کردە سەر ڕۆم و چوار هەزار کەسی ئەسیر کرد و چوارپێ و کەل و پەلی زۆری دەستکەوت. یەکێك لەسوپا سالارەکانی ڕۆم داوای ئەمانی کرد. ئەمانیان پێبەخشی و ئەو باوەڕی بەئیسلام هێنا.

لەم ساڵەدا دووبارە کەیغەلەغ مەبەستی جەنگ و غەزای کرد و خۆی گەیاندە شەکەند و خواوەند، سەرکەوتنی پێبەخشی. ئەو لەوێوە ڕووی کردە لەیس و دەستی بەسەردا گرت و پەنجا هەزار کەسی ئەسیر کرد و جۆگەلەی خوێنی لەڕۆمییەکان ڕەوانە کرد. سوپاکەی بێ هیچ زیانێك گەڕایەوە.

ئەندەرونێقسی بەتریق نامەیەکی بۆ موکتەفی نووسی و داوای ئەمانی کرد. ئەو بەنوێنەرایەتی پاشای ڕۆم، سنورداری هەموو سنورەکانی ڕۆم بوو. موکتەفی ئەمانی پێبەخشی و ئەو لەگەڵ دووسەد ئەسیری موسوڵمان لەقەلاکەی خۆی هاتەدەر. پاشای ڕۆم کەسانێکی بۆ گرتنی ئەو نارد. ئەندرونێقس کەرەستەی جەنگی بەموسوڵماناندا و لەبەرابەر نێردراوانی پاشا خۆڕاگرییان کرد. ئەویان گرت و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانیان کوشت و لەشکرگەکەی تالان کرا. ڕۆمییەکان بۆ جەنگی ئەندرونێقس یەکیان گرت. دەستەیەك لەموسوڵمانەکان بۆ هاوکاری ئەو و موسوڵمانە ئەسیرەکان هاتن. ئەوان گەیشتنە قونییە و ڕۆمییەکان لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوونەوە و لەمەبەستی خۆیان(گرتنی ئەندرونێقس) پەشیمان بوونەوە. دەستەیەك لەموسوڵمانان خۆیان گەیاندە قەلاکەی ئەندرونێقس و ئەو لەگەڵ بنەماڵە و سامانەکەی هاتەدەر و لەگەڵ موسوڵمانان ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر. موسوڵمانان قونیەیان وێران کرد. پاشای ڕۆم کەسی بۆ لای خەلیفە نارد و خوازیاری ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان بوو.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەشام دەرکەوت و خۆی بەسوفیانی ناو دەبرد. ئەویان گرت و بردیانە بەغداد. دواتر وترا ئەو شێتە.

لەم ساڵەدا لەنێوان حسەین کوڕی حەمدان لەلایەك و دەشتەکییەکانی مناڵەکانی کەلب و تەی و یەمەن و ئەسەد لەلایەکی دیکەی جەنگ روویدا.

لەم ساڵەدا عەرەبەکانی تەی، وەسیف کوڕی سەوارتەکینیان لەفید ناکاوگیر کرد. موکتەفی ئەوی وەك سەرپەرەستی حاجییەکان دەستنیشان کردبوو. عەرەبەکان بۆ ماوەی سێ رۆژ ناکاوگیریان کرد. دواتر سوارتەکین هاتەدەر و رووبەڕوویان بوویەوە و ژمارەیەك لەوانی کوشت. عەرەبەکان هەڵاتن و وەسیف لەگەڵ هاوەڵانی خۆی درێژەی بەرێگەدا.

فەزڵ کوڕی عەبدوڵلەی هاشمی لەم ساڵەدا رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ساڵح کوڕی محەممەدی حافیز ناسراو بەجەزرەی بەغداد و باوکی عوبەیدالله محەممەد کوڕی نەسری مەروزی، فەقیهی شافعی، هەردووك مردن. مەروزی نووسراوی زۆرە و لەسەمەرقەند، چاوی لێکنا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، ناسراو بەکوڕی راهویە، کاتێك قەرەمتییەکان حاجییەکانیان دەگرت، لەرێگەی مەککە کوژرا.

## ڕووداوەكانی ساڵی دووسەد و نەوەد و پێنجی كۆچی ( ٩٠٨ زایینی )

مردنی ئیسماعیل كوڕی ئەحمەدی سامانی و هاتنە سەر كاری ئەحمەدی كوڕی
لەنیوەی سەفەر/ بیست و شەشی نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، ئیسماعیل كوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرا ئەلنەهر، لەبوخارا كۆچی دوایی كرد و ئەویان دوای مردن بەنازناوی (ماضی، رابردوو، كۆچ كردوو) ناوبرد. موكتەفی فەرمانی فەرمانڕەوایی بۆ كوڕەكەی نارد و بەدەستی خۆی ئاڵای بۆ بەست.

ئیسماعیل پیاوێكی بیرمەند و دادپەروەر بوو. بەشێوەیەكی چاكە لەگەڵ خەڵكان هەڵس و كەوتی دەكرد و كەسێكی خۆڕاگر بوو.

دەگێرنەوە: مامۆستایەك ئەدەبی فێری ئەحمەدی كوڕی دەكرد. ڕۆژێك ئیسماعیل بێ ئەوەی مامۆستاكەی بزانێت، لەنزیك ئەو تێپەڕی و بیستی مامۆستاكەی جوێن بەكوڕەكەی دەدات و پێی دەڵێت: خواوەند تۆ و ئەو كەسەی تۆ مناڵی ئەویت، خۆش ناوێت (خۆش نەوێت). لەم كاتەدا ئیسماعیل خۆی نیشانی مامۆستاكەدا و وتی: ئەی فلانە كەس! ئێمە گوناحێكمان نەكردووە تا جوێنمان پێ بدەیت، ئایا ناتەوێت جوێن بەمن نەدەیت و تەنیا جوێن بەو كەسە بدەیت كەشیاوە بۆی؟ مامۆستا ترسا و ئیسماعیل بەجێی هێشت و فەرمانیدا بۆ ڕەواندنەوەی ترسی ئەو، دیاری بۆ بنێرن.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك لای ئەو باسی چاكەكاران و پێشینان كرا و ئەو بەیەكێك لەهاونشینەكانی خۆی وت: عێسامی بە نەك عێزامی (بەو مانایە كەڕەچەڵەكی خۆی بۆ عیسام بگەڕێنێتەوە نەك بۆ ئێسقانی مردووەكان. عیسام پیاوێكی بیرمەند و كارزان و چاكەكار بوو كەپشتی بەنەفسی خۆی دەبەست نەك باوباپیرانی. ئەمە هۆنراوەی خۆیەتی:

نفس عصام سودت عصاما          و علمته الكر و الاقداما

واتاكەی: نەفسی عیسام ئەوی كردە سەروەر و گەورە و بوێری و هێرش و جەنگی فێر كرد.

ڕۆژێك ئەو لەیەحیا كوڕی زەكریای نەیشابوری پرسی: لەبەر چی كاتێك حكومەتی بنەماڵەی موعاز لەناوچوو، نیعمەتەكانی ئەوان لەخوراسان پایەدار مایەوە، لەگەڵ ئەوەی هەم خراپەكار بوون هەم ستەمكار؟ بەڵام كاتێك حكومەتی بنەماڵەی تاهیر لەناوچوو، نیعمەتەكانی ئەوان لەخوراسان دیار نەما لەگەڵ ئەوەی هەم دادپەروەر بوون هەم چاكەكار و هەم دادیان لەناو خەڵكدا بڵاو دەكردەوە؟

یەحیا وەڵامی دایەوە: لەبەر ئەوەی كاتێك حكومەتی بنەماڵەی موعاز لەناوچوو، تاهیرییەكان هاتنە سەركار كەهەم دادپەروەر بوون هەم دادگەر و لەڕفاندن و تاڵان كردنی سامانی خەڵكان خۆیان بەدوور دەگرت و خوازیاری چاكەكاری لەگەڵ بنەماڵەكانی ئەوان بوون، بۆ ئەم مەبەستە بنەماڵەی موعازیان پێش خست و ڕێزیان گرتن بەڵام كاتێك حكومەتی بنەماڵەی تاهیر ڕووخا، بنەماڵەی سەفار جڵەوی كاروبارەكانیان گرتەدەست كەستەمكار بوون و دوژمنایەتی بنەماڵە گەورەكانیان كردە پیشە و ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ ڕێزداران و بەتواناكانیان گرتەبەر و بۆ ئەم مەبەستە نیعمەتەكانی ئەوانیان لەناو برد.

ئیسماعیل پێی وت: سڵاوی خواوەند لەتۆ بێت ئەی یەحیا، دڵت ئاسوودە كردم و فەرمانیدا خەڵاتی بكەن.

كاتێك ئیسماعیل دوای براكەی خۆی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، بەهەمان شێوە نامەی بۆ هاورێ نزیكەكانی خۆی دەنووسی كەپێشتر دەینووسی. ئەم خاڵەیان بیرهێنایەوە. لەوەڵامدا وتی: هەركات خواوەند پێگەی ئێمەی بەرز كردەوە، نابێت لەپێگە بەرزی براكانمان كەم بكەینەوە، بەڵكو دەبێت پێگەیەكی بەرزتر و لەپێشتریان پێ ببەخشین تا وەك هەمیشە كەسانێكی سپاسگوزار بن.

كاتێك كوڕەكەی باوكی نەسر ئەحمەد جێگەی باوكی گرتەوە و پێگەی بەرز بوویەوە، مەبەستی جەنگ لەگەڵ خەڵكانی ڕەی كرد. ئیبراهیم كوڕی زەیدویە پێشنیاری پێكرد هێرش بكاتە سەر سەمەرقەند و ئیسحاق كوڕی ئەحمەدی مامی قۆڵبەست بكات تا نەكا دژی ئەو ڕاپەڕێت و سەرقاڵی بكات. ئەحمەد ئەو كارەی كرد و مامی بۆ بوخارا بانگ كرد و كاتێك ئیبراهیم هاتە بارەگاكەی، ئەوی قۆڵبەست كرد. دواتر ڕووی كردە خوراسان و كاتێك ڕۆشتە نەیشابور، بارسی

کەبیر لەترسی ئەو لەجورجانەوە بۆ بەغداد هەڵات.

هۆکاری ترسی بارس ئەوە بوو کەئیسماعیل فەرمانڕەوایەتی جورجانی بەئەحمەدی کوڕی بەخشی. ئەمە دوای ئەوە بوو کەجورجانی لەمحەممەد کوڕی زەید وەرگرتەوە و ماوەیەك دواتر کوڕەکەیشی لەسەر کار لابرد و جورجانی بەبارسی کەبیر سپارد – وەك ئاماژەمان پێدا– لەباجی ڕەی و تەبەرستان و جورجان، بارس سامانێکی زۆری کۆکردەوە تا ئەو جێگەی هەشتا بار چوارپێ درهەم و دیناری پاشەکەوت کرد و بۆ ئیسماعیلی نارد بەڵام کاتێك لەمەرگی ئەو ئاگادار بوویەوە، سامانەکانی گەڕاندەوە. بەم شێوەیە لەهاتنی ئەحمەد ترسا. ئەو نامەیەکی بۆ موکتەفی نووسی و داوای مۆڵەتی کرد تا سەردانی بکات. موکتەفی مۆڵەتی پێدا و بارس لەگەڵ چوار هەزار شەڕکەر بۆ بارەگای موکتەفی ڕۆشت. ئەحمەد سوپایەکی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد بەڵام نەیانتوانی بارس بگرن و بارس لەوێوە ڕێگەی ڕەی گرتەبەر بەڵام نوێنەری ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل لەو شارە سەنگەری گرت و ڕێگەی نەدا بارس بڕواتە ناو شارەکە. بارس ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە ئەو شارە کەموکتەفی مردبوو و موقتەدر خەلافەتی گرتبووە دەست. موقتەدر بەهێزی بارس دڵگەرم و پشت ئەستور بوو. ئەمە لەکاتێکدا بوو کەشۆڕشی کوڕی موعتەز دەستی پێکردبوو. موقتەدر، بارسی لەگەڵ سوپای مناڵەکانی حەمدان بۆ سەرکوت کردنی کوڕی موعتەز ڕەوانە کرد و دیاری ڕەبیعەی خستە ژێر فەرمانی ئەو. هاوەڵانی خەلیفە ترسان نەکا بارس پێش ئەوان کەوێت. کۆیلەیەك لەکۆیلەکانیان ناچار کرد بارس ژەهرخوارد بکات و ژەهر خواردی کرد و بەهۆیەوە مرد. ئەم کۆیلەیە دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت و ژنەکەی کردە هاوسەری خۆی. مەرگی بارس لەموسڵ ڕوویدا.

## مەرگی موکتەفی

لەزیقەعدە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە موکتەفی باللە باوکی محەممەد عەلی کوڕی موعتەزید باللە باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی موەفەق کوڕی متوەکیل کۆچی دوایی کرد. خەلافەتی ئەو شەش ساڵ و شەش مانگ و نۆزدە ڕۆژ درێژەی کێشا و ساڵەکانی ژیانی لەسی و سێ یا سی و دوو ساڵ کۆتایی پێهات. ئەو چوارشانە، جوان روخسار، ڕەنگ پەڕاو و ڕیشێکی چڕی بوو. نازناوەکەی باوەکی محەممەدە. دایکی، دایکی منالْ و تورك بوو بەناوی جیجەك. موکتەفی چەندین مانگ نەخۆش و کاتێك مرد، لەماڵی محەممەد کوڕی تاهیر بەخاك سپێردرا.

## خەلافەتی موقتەدر باللە

چۆنیەتی خەلافەتی موقتەدر باللە یا هەمان باوکی فەزلْ جەعفەر کوڕی موعتەزید بەم شێوە بوو: کاتێك نەخۆشییەکەی موکتەفی پەرەی سەند، عەباس کوڕی حەسەنی وەزیر بیری لەکەسێك کردەوە تا بۆ جێگرتنەوەی موکتەفی شیاو بێت. وەزیر هەرکات دەڕۆشتە دارئەلخلافە، یەکێك لەم چوارکەسە کەسەرپەرەستی دیوانەکان بوون، هاورێیەتیان دەکرد: باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی داوود کوڕی جەراح، باوکی حەسەن محەممەد کوڕی عەبدان، باوکی حەسەن عەلی کوڕی محەممەد کوڕی فورات و باوکی حەسەن عەلی کوڕی عیسا. ڕۆژێك وەزیر لەگەڵ محەممەد کوڕی داود لەم بارەوە گفتوگۆی کرد و ئەو عەبدوللە کوڕی موعتەزی پێشنیار کرد و ئەوی بەکەسێکی بیرمەند و ئەدیب و چارەسەرکەر لەقەڵەمدا. وەزیر دواتر لەگەڵ حسەن کوڕی فورات راوێژی کرد. وتی: عادەتی من نەبووە کەس راوێژم پێ بکات بەڵکو من خۆم لەگەڵ کەسانی دیکە راوێژ دەکەم ئەویش بۆ دیاری کردنی فەرمانڕەوا و کارگوزارەکان نەك خەلیفەکان. وەزیر توڕە بوو و وتی: ئەم بێدەنگییە شان خاڵی کردنە لەژێر بەرپرسیارەتی و تۆ لەبۆچوونی راست

ئاگاداریت. وەزیر پێداگری کرد و حەسەن کوڕی فورات لەوەڵامدا وتی: ئەگەر وەزیر دەخوازێت کەسێك هەڵدەبژێرێت، ئەو کارە بکات. وەزیر تێگەیشت کەمەبەستی کوڕی فورات لەم وتەیە کوڕی موعتەزە. وەزیر وتی: رازی نابم تا ئەو کاتەی بەراشکاوی هەموو شتێکم پێ بڵێیت. کوڕی فورات وتی: وەزیر دەبێت لەخوا بترسێت و کەس هەڵنەبژێرێت مەگەر ئەوەی بەجوانی و لەهەموو رووەکانەوە بیناسێت. وەزیر نابێت کەسێکی نەشیاو بۆ ئەو پۆستە دیاری بکات کەبارودۆخ لەخەڵکان دژوار و رۆژانەکانیان ببرێت، نابێت کەسێکی تەماحکار بێنێتە سەرکار کەچاوی تەماح لەسامانی خەڵکان ببڕێت و زەوی و دارایی ئەوان زەوت بکات، نابێت کەسێك هەڵبژێرێت کەکەمتر بەدینەوە خۆی سەرقاڵ بکات و لەسزای گوناحەکانی نەترسێت، وەزیر دەبێت کەسێك هەڵبژێرێت کە بەمەبەستی بەدەست هێنانی پاداشتی ئەودنیا هەوڵ بدات نەك کەسێك کەچاوی تەماح ببڕێتە دەوڵەمەندی یا زەوی و زار یا ئەسپی خەڵکان، دەبێت کەسێك بێت بەردەوام خەڵکان ببینێت و خەڵکانیش تێکەڵاوی بن، ئەو دەبێت ئاسوودەیی و ئاسایشی خەڵکان لەبەر چاو بگرێت و داهات و خەرجییەکان بزانێت. وەزیر وتی: راستت وت و چاکەخوازی من بوویت، تۆ پێشنیاری کێ دەکەیت؟ کوڕی فورات وتی: لەهەموان باشتر جەعفەر کوڕی موعتەزیدە. وەزیر وتی: هاوار لەتۆ، ئەو هێشتا منالە. کوڕی فورات وتی: بەڵام منالی موعتەزیدە، ئێمە نابێت پیاوێکی تەواو و کامڵ هەڵبژێرین کەخۆی کاروبارەکان بەڕێوە ببات و لەئێمە بێ نیاز بێت. دەبێت هەمیشە نیازمەندی ئێمە بێت.

دواتر وەزیر لەگەڵ عەلی کوڕی عیسا راوێژی کرد بەڵام عەلی کوڕی عیسا ناوی کەسی نەبرد و وتی: وەزیر دەبێت لەخواوەند بترسێت و بیر لەکەسێك بکاتەوە کەبۆ دین و دنیا شیاو بێت. وەزیر بیری لەپێشنیارەکەی کوڕی فورات کردەوە، وەسیت نامەکەی موکتەفیش جەختی لەسەر ئەم پێشنیارە دەکردەوە چوونکە موکتەفی لەکاتی نەخۆشییەکەیدا وەسیەتی کردبوو دوای ئەو جەعفەری برای وەك خەلیفە دەستنیشان بکەن. کاتێك موکتەفی مرد، وەزیر جەعفەری وەك جێگری ئەو لەسەر تەختی خەلافەت دانیشاند. وەزیر، سافی حەرەمی بۆ لای جەعفەر نارد و

ئەوی لەمانەوە لەکۆشکی بنەماڵەی تاهیر کە لەبەشی رۆژئاوای شارەکە بوو، ئاگادار کردەوە. کاتێك ساف، جەعفەری سواری بەلەم کرد و رێگەی کۆشکی خەلافەتی گرتەبەر و گەیشتە بەردەم کۆشك، کۆیلەکانی وەزیر هاواریان بەرز کردەوە تا کەشتیوانەکە بڕواتە کۆشکی وەزیر. لەم کاتەدا ساف حەرەمی گومانی کرد وەزیر دەخوازێت جەعفەر قۆلبەست بکات و کەسێکی دیکە وەك خەلیفە هەڵبژێرێت، لەبەر ئەمە رێگەی نەدا کەشتیوانەکە دابەزێت و لەوێوە بەرەو کۆشکی خەلافەت بەرێکەوت و ساف لەکۆیلەکان و کەسانی نزیك بۆ جەعفەر بەیعەتی وەرگرت و جەعفەر خۆی بەموقتەدر بالله ناو برد. لەم کاتەدا وەزیر و کەسانی دیکە هاتنە لای جەعفەر و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. دواتر جەنازەی موکتەفییان بۆ بەخاك سپاردت ئامادە و لەماڵی محەممەد کوڕی تاهیر دفنیان کرد.

لەکاتی بەیعەتی موقتەدر، پانزە هەزار دینار لەگەنجینەدا بوو. ئەو، دەستی وەزیری ئاوەلاّ کرد و وەزیر ماڤ بەیعەتی لەگەنجینە هەڵگرت (وەك بڵێی هەرکەسێك بەیعەتی دەبەست، پارەیان پێ دەدا)

رۆژی لەدایك بوونی موقتەدر هەشتی رەمەزانی ٢٨٢/ دووی نۆڤەمبەری ٨٩٥ زایینی بوو. دایکی ئەو دایکی منالّ بوو بەناوی شەغب. کاتی بەیعەت لەگەڵ موقتەدر، وەزیر ئەوی بەکەم بەها زانی چوونکە لەو کاتەدا تەمەنی سیانزە ساڵ بوو. خەڵکان لەمبارەوە قسەیان کرد تا ئەوەی وەزیر بڕیاریدا ئەو لەسەر کار لاببات و باوکی عەبدولله محەممەد کوڕی موعتەمید عەلی الله بێنێتە سەر کار. ئەو پیاوێکی چاکەکار بوو. وەزیر نامەی بۆ نووسی بەلاّم لەگەڵ ئەوەیشدا چاوەڕوانی هاتنی بارس، پەردەداری ئیسماعیل، فەرمانڕەوای خوراسانی دەکرد. پێشتر وتمان کەوەزیر مۆڵەتی هاتنی پێدابوو. وەزیر دەویست لەمبارەوە هاوکاری لێ وەربگرێت و بەبوونی ئەو بەسەر کۆیلەکانی موعتەزید سەرکەوتن بەدەست بێنێت. بارس درەنگ گەشت.

رۆژێك لەنێوان باوکی عەبدولله کوڕی موعتەمید و کوڕی عەمرەویە، فەرماندەی پاسەوانەکان، لەسەر پارچە زەوییەك کەموڵکی هەردووکیان بوو، بگرە و بێنە هاتە ئاراوە و عەمرەویە بەشێوەیەکی توند لەگەڵ باوکی عەبدولله قسەی کرد. باوکی

عەبدوللە تورە بوو تا ئەو جێگەی لەهۆش چوو و کەوتە سەرزەوی. ئەویان لەسەر تەخت بردە سیتە و لەدووەم رۆژدا مرد. وەزیر بڕیاریدا بۆ باوکی حسەین کوڕی متوەکیل بەیعەت وەربگرێت. ئەویش پێنج رۆژ دواتر مرد و بەمشێوەیە بارودۆخ بۆ موقتەدر ئارام و جێگیر بوو.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەا لەنێوان نەجح کوڕی جاخ ( لەتەبەری عەج کوڕی حاج هاتووە) و سوپاییەکان لەمەنی لەرۆژی دوانزەی زیحەججە/ سێی سێپتامبەر ئاژاوە هاتە ئاراوە و دەستەیەك لەوان کوژران چوونکە سوپاییەکان خوازیاری پاداشتی بەیعەتی موقتەدر بوون. بەهۆی ئەم جەنگە خوێناوییەوە ئەو کەسانەی لەمەنی بوون، بۆ باغی کوڕی عامر هەلاّتن و حاجییەکان لەکاتی گەڕانەوە گرفتاری تینویەتییەکی ئەوتۆ بوون کەژمارەیەکیان مردن. دەگێڕنەوە یەك لەوان لەتاو تینویەتی ژەهراوی دەخواردەوە.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی ئیبراهیمی مەسمەعی بەمەبەستی ناسازگاری کردن لەگەڵ خەلیفە لەئیسفەهانەوە رووی کردە یەکێك لەگوندەکان و نزیکەی بیست هەزار کەس لەکوردەکان وکەسانی دیکە لەدەوری کۆبوونەوە. خەلیفە، بەدری حومامی لەگەڵ پێنج هەزار سەرباز بۆ جەنگی ئەو رەوانە کرد. لەلایەکی دیکە مەنسور کوڕی عەبدوللە کوڕی مەنسوری کاتبی بۆ لای عەبدوللە نارد تا لەدواهاتەکانی ناسازگاری ئاگاداری بکاتەوە. مەنسور رۆشتە لای عەبدوللە و پەیامەکەی خەلیفەی گەیاند. عەبدوللە ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی خەلیفە نیشاندا و رێگەی بەغدادی گرتەبەر و کەسێکی وەك جێگری خۆی لەئیسفەهان دانا. موکتەفی لەگوناحەکەی خۆش بوو.

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی موسا لەگەڵ عەرەبەکانی تەی جەنگی. ئەوان وەسیفیان ناکاوگیر کردبوو. حسەین بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشی کردە سەریان و ژمارەیەکی زۆری کوشت و دەستەیەکی ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی ئەحمەد لەگەڵ ئەو کوردانەی دەستیان بەسەر

کەنارەکانی موسڵدا گرتبوو، جەنگی و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و خوێنی ئەوانی حەڵاڵ و سامانەکانی تاڵان کرد. سەرکردەی کوردەکان بۆ کێوەکان هەڵات و کەس نەیتوانی بیگرێت.

لەم ساڵەدا موزەفەر کوڕی جاخ بەشێك لەو زەویانەی خارجی لەیەمەن دەستی بەسەردا گرتبوو، وەرگرتەوە و یەکێك لەسەرکردەکانی ئەوی بەناوی حەکیمی دەستگیر کرد.

لەزیقەعدە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ئاڵ و گۆڕی دیلە موسوڵمان و رۆمییەکان ئەنجامدرا. لەم ئاڵ و گۆڕەدا خوێنبایی سیٚ هەزار ژن و پیاویاندا.

فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی ریٚ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی مەهرانی جورجانی ئیسماعیلی، حەدیس بێژ و فەقیهی شافعی، محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی نەسر باوکی جەعفەری تەرموزی، فەقیهی شافعی، باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی محەممەدی نوری شێخی سۆفییە، حسەین کوڕی عەبدوللە کوڕی ئەحمەد باوکی عەلی خێرەقی، فەقیهی حەنبەلی، عەبدوللە کوڕی باوکی دارە، مردن. لەناو ئەواندا باوکی جەعفەری تەرموزی لەبەغداد مرد و خێرەقی لەرۆژی جەژنی رەمەزان کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و شەشی کۆچی ( ٩٠٩ زایینی )

### لابردنی موقتەدر و خەلافەتی کوڕی موعتەز

لەم ساڵەدا، سەرکردەکان، فەرماندەکان، قازییەکان و دەبیرەکان لەگەڵ عەباس کوڕی حەسەنی وەزیر بڕیاریاندا موقتەدر لەسەر کار لابەرن و بەیعەت لەگەڵ کوڕی موعتەز ببەستن. ئەوان پەیامەکەی خۆیان بۆ کوڕی موعتەز نارد. ئەو بەمەرجێك رازی بوو خەلافەت بگرێتەدەست نەجەنگ رووبدات نەخوێنێك بڕێژێت. ئەوان کوڕی موعتەزیان ئاگادار کردەوە کەهەموان بۆ خەلافەتی ئەو یەکدەنگ و کۆکن و کەس ناسازگاری ئەوان ناکات و جەنگ روونادات.

لەپێشەوەی ئەم دەستەیە، عەباس کوڕی حەسەن و محەممەد کوڕی داوود کوڕی جەراح و باوکی موسەنا ئەحمەد کوڕی یەعقوبی قازی، و لەسەرکردەکان حسەین کوڕی حەمدان و بەدری ئەعجەمی و وەسیف کوڕی سەوارتەکین دەبینران.

. . دواتر وەزیر مانەوەی لەگەڵ موقتەدر بەباشتر زانی و ئەوی بەو شێوەیە بینی کەدەخوازێت بۆیە لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە بەڵام کەسانی دیکە دژی ئەو شۆڕشیان کرد و خوێنیان ڕشت. لەناو ئەم دەستەیە حسەین کوڕی حەمدان و بەدری ئەعجەمی و وەسیف، کوشتنی وەزیریان گرتە ئەستۆ و کاتێك وەزیر بەرەو بێستانەکەی خۆی دەڕۆشت، خۆیان پێگەیاند و کوشتیان. فاتەکی موعتەزیدیان لەگەڵ وەزیردا کوشت و ئەم پێشهاتە لەبیست رەبیع الاوەل/ هەژدەی دێسامبەر ڕوویدا. موقتەدر بەیانی ئەو ڕۆژە لەسەر کار لابرا و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ کوڕی موعتەز بەست.

حسەین کوڕی حەمدان دوای کوشتنی وەزیر بۆ گۆڕەپانی گەمەی گۆی گەڕایەوە کەموقتەدر لەوێ سەرقاڵی یاری کردن بوو. حسەێن دەیویست خوێنی موقتەدر بڕێژێت بەڵام لەوێ نەیبینی و لەوێ بوو موقتەدر لەکوژرانی وەزیر و فاتەك ئاگادار بوویەوە و دەرگاکانی بەرووی خۆیدا داخست. حسەین کوڕی حەمدان لەوەی بۆ سەرەتا موقتەدری نەکوشتووە، پەشیمان بوویەوە.

ئەوان کوڕی موعتەزیان هێنا و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. محەممەد کوڕی سەعیدی ئەزەرەق کاروباری وەرگرتنی بەیعەتی گرتە ئەستۆ. هەموو خەڵکان و سەرکردەکان وسەرپەرەستەکانی دیوان هاتن جگە لەباوکی حەسەن کوڕی فورات و کەسە نزیکەکانی موقتەدر. کوڕی موعتەز، نازناوی مرتضی بالله ی پێبرا. ئەو، محەممەد کوڕی داود کوڕی جەراحی وەك وەزیر دەستنیشان کرد و دیوانەکانی بەعەلی کوڕی عیسا سپارد. نامەی سەروەری باوەڕدران بۆ هەموو ناوچە ئیسلامییەکان ڕەوانە کرا. فەرمانی بەموقتەدردا بڕواتە کۆشکی کوڕی تاهیر کەپێشتر لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد بۆ ئەوەی خۆی بەرەو کۆشکی خەلافەت بەرێکەوێت. موقتەدر تا شەو داوای مۆڵەتی لێکرد بۆ ئەوەی فەرمانەکەی بەئەنجام بگەیێنێت.

بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە حسەین کوڕی حەمدان ڕۆشتە کۆشکی خەلافەت. خزمەتکار و کۆیلەکان و پیادەکانی موقتەدر لەپشت دەرگا و دیوارەکانەوە ڕووبەڕووی بوونەوە. حسەین لەکۆتایی ڕۆژ دەستی لەوان هەڵگرت و لەشەودا بنەماڵە و سامانەکەی خۆی لەرێگەی بەغدادەوە بردە موسڵ و نەزانرا بۆ ئەو کارەی کرد. لەسەرکردەکان جگە لەمونسی خادم و مونسی خازن و غەریب ئەلخال و دەستەیەك لەکەسانی تر، کەس لەدەوری موقتەدر نەمایەوە.

کاتێك موقتەدر ویستی کۆشك بەجێبێڵێت، یەکێك لەکەسانی دەورووبەر بەوی دیکەی وت: ئێمە هەرگیز تەسلیم نابین و دەستبەردای خەلافەت نابین مەگەر ئەوەی ناچار بین و دەبێت هەوڵ بدەین و بەرگری لەخەلیفە بکەین. بڕیاریاندا لەرێگەی دیجلەوە بەرەو کۆشکی کوڕی موعتەز بڕۆن و لەوێ ڕووبەڕووی ببنەوە. کاتێك موقتەدر لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار بوویەوە، ئەنباری کەرەستەکانی جەنگی کردەوە و خستیە بەردەستی ئوان. ئەوان سوار بەلەم و کەشتییەکان بوون و بەپێچەوانەی ڕەوتی ئاوی دیجلە بەرێکەوتن تا گەیشتنە کۆشکی کوڕی موعتەز. کاتێك کەسانی دەورووبەری کوڕی موعتەز فراوانی ژمارەی ئەوانیان بینی، ترسان و پێش گەیشتنی ئەوان هەڵاتن و بەیەکیان وت: حسەین کوڕی حەمدان دەیزانی چی ڕوودەدات بۆیە شەوانە هەڵات. هۆکاری هەڵاتنی ئەو کەین و بەینی لەگەڵ موقتەدر بووە.

کوڕی موعتەز کاتێك ئەمەی بینی، سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و لەگەڵ وەزیرەکەی محەممەد کوڕی داود هەڵات. یەکێك لەکۆیلەکان لەپێشەوەی ئەم دوانە هاواری دەکرد: بۆ خەلیفەی سونی بەربەهاری خۆتان بپارێنەوە. ئەویان بەبەربەهاری ناودەبرد چوونکە حسەین کوڕی قاسم کوڕی عوبەیداللە بەربەهاری پێشەوای حەنبەلییەکان و سونییەکان و خەڵکانی سوونی بەتەواوی بەو باوەڕدار بوون.

کوڕی موعتەز دەویست بەم وتەیە پشتیوانی خەڵکان بەدەست بێنێت ئەگەری هەیە هاوکاری بکەن.

کوڕی موعتەز و هاوەڵانی بۆ سارا هەڵاتن و گوامانیان دەکرد ئەو سوپایە پەیمانیان لەگەڵ بەستوون، پەیوەستیان دەبن بەڵام کەس پەیوەستیان نەبوو. ئەوان دەیانویست لەگەڵ ئەو سوپاییانەی پەیوەستیان دەبن، رێگەی سامەرا بگرنەبەر بەڵام کاتێك کەس لەدەوریان کۆنەبوویەوە، لەبڕیارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە. محەممەد کوڕی داود لەماڵەکەیدا خۆی شاردەوە و کوڕی موعتەز لەگەڵ کۆیلەکەی یەمەن، ڕۆشتنە ماڵی باوکی عەبدوللە کوڕی جەساس. ئەو پەنای بەم دووانە بەخشی. زۆربەی ئەو کەسانەی پەیمانیان لەگەڵ موعتەز بەستبوو، خۆیان شاردەوە و شۆڕش و تاڵان و برەو لەشاری بەغداد دەستی پێکرد و دز و چەتەکان ماڵی خەڵکیان تاڵان کرد.

کوڕی عەمرەویە، فەرماندەی پاسەوانەکان کەپەیمانی لەگەڵ کوڕی موعتەز بەستبوو، هەڵات. ئەو دوای هەڵاتن، هاوەڵانی کۆکردەوە و بۆ فریودان، دروشمی موقتەدری بەرز کردەوە بەڵام خەڵکان ئەویان بەدرۆزن ناو برد و دووریان خستەوە. ئەو هەڵات و خۆی شاردەوە و هاوەڵانی بڵاوەیان لێکرد. یەحیا کوڕی عەلی بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو، ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| بایعوه فلم یکن عند الانـــ | وك الا التغییر و التخبیط |
| رافضیون بایعوا انصب الا | مة هذا لعمری التخلیط |
| ثم ولی من زعقة و محامو | ه و من خلفهم لهم تضریط |

واتاکەی: لەگەڵ ئەو (کوڕی موعتەز) پەیمانیان بەست و لای مرۆڤ نەزان جگە

لەگۆڕانکاری و بێ ئاوزی هیچی دیکە دەست ناکەوێت. ئەوانەی پەیمانیان بەست، رافزی بوون کە لەگەڵ ناسبی (دوژمنانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب) پەیمانیان بەست و ئەمە جگە لەگۆڕنکاری هیچی دیکە نییە. ئەوان و پشتیوانەکانیان کە لەپشتەوە تریان لێ دەدا، بەیەك دەنگ هەڵاتن.

موقتەدر دەستبەجێ مونسی خازنی وەك سەرکردەی پاسەوانەکان دەستنیشان کرد. ئەو جیاواز لەمونسی خادم بوو. موقتەدر ڕۆشتە ناو سوپاییەکان و وەسیف کوڕی سەوارتەکین و دەستەیەکی دیکەی گرت و هەموویانی کوشت. ئەو، باوکی عەمرۆی قازی و عەلی کوڕی عیسا و قازی محەممەد کوڕی خەلەف وەکیعی گرت بەڵام ئەوانی ئازاد کرد. موقتەدر، قازی موسەنا ئەحمەد کوڕی یەعقوبی گرت و کوشتی چوونکە پێی وترا بەیعەت لەگەڵ موقتەدر ببەستێت، بەڵام وتی: هەرگیز بەیعەت لەگەڵ منداڵێك نابەستم. ئەو بەیعەتی لەگەڵ کوڕی موعتەز بەستبوو. لەبەر ئەمە خوێنیان ڕشت.

موقتەدر نێردەیەکی بەدوای باوکی حەسەن کوڕی فورات کەخۆی شاردبووەوە، نارد و ئەوی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد. پێگەی وەزارەتی پێبەخشی و خەڵاتی کرد.

ئەم ڕووداوە دیاردەی سەرنج ڕاکێشی تایبەت بەخۆی هەیە: یەك ئەوەی هەموو خەڵکان بۆ لابردنی موقتەدر و بەیعەت لەگەڵ موعتەز هاودەست بوون بەڵام مەبەستەکەیان سەری نەگرت و پێچەوانەی ویستی ئەوان ڕوویدا و تەنیا مەبەستەکانی خواوەند دێتەدی و بەس.

یەکیتر ئەوەی کوڕی حەمدان کەشیعە بو و خوازیار پەیوەست بوون بەبنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، بۆ بەبەستنی بەیعەت لەگەڵ کوڕی موعتەز هەوڵی دەدا لەگەڵ ئەوەی دەیزانی ئەو شوێنکەوتەی عەلی نییە و لەدوژمنایەتی کردنی ئەو درێغ ناکات.

دواتر کۆیلەی کوڕی جەساس بەناوی سوسەن، ساق حەرەمی ئاگادار کردەوە کەکوڕی موعتەز سەروەری ئەوە و دەستەیەك هاوڕێیەتی ئەو دەکەن. هاوەڵانی موقتەدر هێرشیان کردە سەر ماڵی کوڕی جەساس و کوڕی موعتەزیان لەوێ هێنایەدەر و تا شەو لەزینداندا هێشتیانەوە و ئەوەندە هێلکە گونیان گوشی کە

لەتاو ئازارەکەی گیانی سپارد. دواتر ئەویان کفن کرد و بۆ بنەماڵەکەیان گەڕاندەوە.

سامانێکی زۆر لەکوڕی جەساس سەندرا. محەممەد کوڕی داود وەزیری کوڕی موعتەزیان گرت کەخۆی شاردبوویەوە و کوشتیان. عەلی کوڕی عیسایان بۆ واست دوور خستەوە. ئەو نوێنەری بۆ لای کوڕی فورات نارد و داوای لێکرد مۆڵەتی پێبدات بەرەو مەککە بڕوات. کوڕی فورات مۆڵەتی پێدا و ئەو لەرێگەی بەسرەوە ڕۆشتە مەککە و لەوێ مایەوە.

سەد هەزار دیناریان لەباوکی عەمرۆی قازی وەرگرت و سوپایەك بۆ گرتنی حسەین کوڕی حەمدان لەبەغدادەوە تا موسڵ و لەوێوە تا بەڵەد ڕۆشت بەلاّم ئەویان نەگرت و سوپاکە بۆ بەغداد گەڕایەوە. وەزیر نامەیەکی بۆ براکەی حسەین، باوکی هەیجا کوڕی حەمدان فەرمانڕەوای موسڵ نووسی و داوای لێکرد شوێنپێی حسەین هەڵگرێت وئەو بەمەبەستی گرتنی براکەی بەرەو بەڵەد بەرێکەوت بەلاّم حسەین لەوێوە ڕوویکردە سەنجار (شەنگال) و براکەی بەدوایەوە بوو. حسەین ڕۆشتە بەڕیە و براکەی بۆ ماوەی دە ڕۆژی بەردەوام ئەسپی غاردا و سەرئەنجام خۆی پێگەیاند. جەنگ دەستی پێکرد و سەرکەوتن بەباوکی هەیجا بڕا و دەستەیەك لەهاوەڵانی حسەینی ئەسیر و دەهەزار دیناری لەحسەین وەرگرت و بۆ موسڵ گەڕایەوە و لەوێوە ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و کاتێك لەتکریت نزیك کەوتەوە، حسەینی برای خۆی پێگەیاند و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر و دەستەیەك لەوان کوژران. باوکی هەیجا بەرەو بەغداد بەرێکەوت.

حسەین نوێنەرێکی بۆ لای کوڕی فورات، وەزیری موقتەدر، نارد و خوازیاری بەدەست هێنانی ڕەزامەندی موقتەدر بوو. کوڕی فورات نێوەنجیگەری کرد تا موقتەدر حسەین کوڕی حەمدان و ئیبراهیم کوڕی کەیغلەغ و کوڕی عەمرویە، فەرماندەی پاسەوانەکان و دەستەیەکی دیکە ببەخشێت. موقتەدر ئەوانی بەخشی. حسەین هاتە بەغداد و براکەی ئەوەی لێ سەندبوو، بۆی گەڕاندەوە. حسەین لەبەغداد مایەوە تا ئەوکاتەی فەرمانڕەوایەتی شاری قومی پێ سپێردرا و بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت. ئەو پێش ڕۆشتن لیستی ناوی ئەو کەسانەی دژی موقتەدر

شۆڕشیان کردبوو، دڕاندی و فڕێدایە ناو دیجلە (تا کەس لەدوژمنایەتی ئەوان بۆ موقتەدر ئاگادار نەبێتەوە و ئەمە نیشانەی جوامێری ئەوە) کوڕی فورات دادپەروەری و چاکەکاری بڵاو کردەوە و بۆ عەباسییەکان و تالبییەکان ڕۆژانەی دیاری کرد و سەرکردەکانی بەپارە رازی و زۆربەی پارەی گەنجینەی بڵاو کردەوە.

## گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی لەهاوشێوەکانی دەبێت وشیار و ئەو ئاکارەی لەم ڕووداوەدا دەردەکەوێت

سلێمان کوڕی حەسەن کوڕی مەخلەد لەگەڵ کوڕی فوراتی وەزیر، پەیوەندی و هاوڕێیەتی هەبوو. ڕۆژێك وەزیر نامەی کوڕی موعتەزی بەدەستخەتی سلێمان دۆزییەوە چوونکە سلێمان و محەممەد کوڕی جەراح هاوڕێی یەك بوون. وەزیر ئەم بەیعەت نامەی لەموقتەدر شاردەوە و لەچاکەکردن لەگەڵ سلێمان بەردەوام و ئەوی بۆ فەرمانڕەوایەتی ناوچەکان دەستنیشان دەکرد. سلێمان لای موقتەدر بەخراپی باسی کوڕی فوراتی کرد و پێرستێکی ئامادە کرد کە لەخۆگری زەوی و کێڵگەکانی و سامانی کوڕی فورات بوو. دەیویست ئەم پێرستە بەموقتەدر بگەیێنێت بەڵام دەرفەتی دەستنەدەکەوت.

ڕۆژێك سلێمان هاتە ماڵی وەزیر و ئەم پێرستە کە لەناو قۆڵی عاباکەیدا بوو، کەوتە خوار. یەکێك لەدەبیرەکان دۆزییەوە و تەسلیم بەوەزیری کرد. کاتێك وەزیر خوێندیەوە، سلێمانی گرت و ئەوی بەبەلەمێك بۆ واسط نارد و کەسی ڕاسپارد تا چاودێریێ بکات. وەزیر سامانەکانی زەوت کرد بەڵام دواتر لێی خۆش بوو و ئەم نامەی بۆ نووسی: خواوەند ڕێزت لێ بگرێت، لێکۆڵینەوەم لەماف خۆم و گوناحەکەی تۆ کرد، بیری خزمەتەکانی ڕابردووی تۆ کەوتمەوە و ئەمە بووە هۆی ئەوە تۆ ببەخشم و داوات لێ بکەم بۆ لای من بگەڕێیتەوە و هیوادارم وەك جاران چاکەخوازی من بیت. وەزیر دە هەزار درهەمی پێدا و لێی خۆشبوو. دوبارە ئەوەی بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکان ڕاسپارد و چاکەکاری کردە پیشە.

## فەرمانڕەوای باوکی موزێر لەئەفریقییە و هەڵاتنی ئەو بۆ عێراق و دەرئەنجامی کارەکەی

لەسەرەتای رەمەزان/ مەی ئەم ساڵە، باوکی موزێر زیادە اللە کوڕی باوکی عەباس کوڕی عەبدوللە دوای کوژرانی باوکی فەرمانڕەوایەتی ئەفریقییەی گرتەدەست. ئەو بەخۆش گوزەرانی و مێبازی و هاونشینی لەگەڵ خزمەتکار و قەشمەرەکان سەرقاڵ بوو و کاروباری وڵاتی بەخەڵکانە سپارد.

ئەو لەزمانی باوکی نامەیەکی بۆ ئەحوەلی مامی نووسی و داوای لێکرد بەپەلە پەیوەستی ببێت. ئەحوەل لەکوژرانی باوکی عەباسی برای ئاگادار نەبوو، بەخێرایی هات و کاتێك گەیشتە بارەگاکەی، باوکی موزێر، خوێنی ڕشت. ئەو هەرکام لەم مام و براکانی کەتوانی بیانگرێت، کوشتی.

لەرۆژگاری ئەو باوکی عەبدوللەی شیعی پێگەی بەرز بوویەوە. ئەحوەل لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری دەکرد بەڵام کاتێك ئەحوەل کوژرا، گۆڕەپان بۆ باوکی عەبدوللە تەخت بوو و هەموو شارەکان و دانیشتوان، ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا. زیادە اللە سوپایەکی بەفەرماندەیی کوڕە مامەکەی ئیبراهیم کوڕی باوکی ئەغلەب بۆ جەنگی باوکی عەبدوللە ڕەوانە کرد. ژمارەی ئەم سوپایە جگە لەو کەسانەی پەیوەستیان بوون، دەگەیشتە چل هەزار کەس. باوکی عەبدوللەی شیعی- بەو شێوەی لەسەرەتادا ئاماژەمان پێدا- شکستی بەسوپاکەی ئیبراهیم هێنا. کاتێك زیادە اللە لەشکانی سوپاکەی ئیبراهیم ئاگادار بوویەوە، دڵنیا بوو لەوەی چیتر کاتی مانەوە نییە چوونکە ئەو سوپایە هەموو هێز و تواناى ئەو بوو. ئەو، بنەماڵە، سامان و ئەوەی بەبەهاداری دەزانی، هەڵیگرت و مەبەستی هەڵاتن بۆ سەرزەمینەکانی رۆژهەڵاتی کرد و لای خەڵکان وای نیشاندا کەهەواڵی شکستی باوکی عەبدوللەی پێگەیشتووە. فەرمانیدا زیندانییەکانیان لەزیندان هێنایەدەر و هەموویانی کوشت و ڕووداوەکانی بەراستی بۆ کەسە نزیکەکانی خۆی گێڕایەوە و داوای لێکردن لەگەڵ ئەو بەرێکەون.

یەکێك لەپیاوانی دەوڵەت پێشنیاری کرد ئەو کارە نەکات و دەستەبەرداری فەرمانڕەوایەتی نەبێت. ئەو پێی وتن: باوکی عەبدوللە هێرش ناکاتە سەر زیادە اللە. زیادەاللە جوێن بارانی کرد و بەبۆچوونەکەی رازی نەبوو، وتی: تۆ هیواداری ئەو ئەسیر و زیندانیم بکات. کەسە نزیکەکان و بنەماڵەکەی بلاّو بوونەوە تا خۆیان بۆ ڕۆشتن لەگەڵ زیادە اللە ئامادە بکەن.

فەرمانڕەوایی بنەماڵەی ئەغلەب لەئەفریقییە درێژەی کێشابوو و ژمارەیەکی زۆر لەبەندە و کۆیلەکان لەگەڵ ئەواندا بوون و بەم شێوەیە هێز و دەسەلاّتیان زیادی کردبوو. زیادە اللە لەساڵی ٢٩٦/٩٠٩ زایینی لەئەفریقییەوە رووی کردە میسر و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو ڕۆشت و گەیشتە تەرابلوس و ڕۆشتە ناو شارەکە و بۆ ماوەی نۆزدە رۆژ لەوێ مایەوە. ئەو لەتەرابلوس باوکی عەباس برای عەبدوللەی شیعی بینی. پێشتر زیادە اللە لەقیروان زیندانی کردبوو بەلاّم ئەو بۆ تەرابلوس هەلاّت. کاتێك زیادە اللە ئەوی بینی، هێنایە بارەگاکەی و پرسیاری لێکرد ئایا برای باوکی عەبدوللەیە؟ ئەو بەم وتەیە رازی نەبوو، وتی: من بازرگانێکم کەدەستەیەك من بەبرای باوکی عەبدوللە دەزانن و تۆ بەو گومانە منت زیندانی کرد. زیادە اللە پێی وت: من ئازادت دەکەم ئەگەر راستت وتبێت کەبازرگانی، بەلاّم تاوانبار نین ئەگەر درۆت کردبێت و برای باوکی عەبدوللە بیت، دەبێت رێز لەم چاکەکارییەی ئێمە بگریت و رێگەی نەدەیت پاشماوەکانی ئێمە زیانیان پێ بگات. زیادە اللە ئازادی کرد.

ئیبراهیم کوڕی باوکی ئەغلەب یەکێك لەهاوەڵە گەورە و نزیکەکانی زیادە اللە بوو. زیادە اللە بریاریدا ئەو و پیاوێکی دیکە کەخوازیاری فەرمانڕەوایەتی سنووری قیروان بوون، لەناو ببات. ئەم دوانە لەمەبەستی زیادە اللە ئاگادار بوونەوە و بۆ میسر هەلاّتن و ڕۆشتنە لای فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە کەعیسا نەوشەری بوو. گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و بەخراپە ناوی زیادە اللە یان برد و وتیان: زیادە اللە بیر لەفەرمانڕەوایەتی میسر دەکاتەوە. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر نەوشەری بەجێهێشت و ویستی بەوەرگرتنی مۆڵەت لەخەلیفە، رێگە نەدات زیادە اللە بێتە ناو میسر بەلاّم زیادە اللە لەشەودا گەیشت و بەزۆر لەپردی جیزە

پەڕییەوە. نەوشەری کاتێك ئەمەی بینی، چیتر نەیتوانی ڕێگەی لێ بگرێت. ئەوی بردە مالی کوڕی جەساس و هاوەلانی لەمالەکانی دیکە نیشتەجێ کرد. زیادە الله هەشت ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر مەبەستی بەغدادی کرد. دەستەیەك لەهاوەلانی هەلاتن. یەکێك لەوان کۆیلەیەك بوو کەسەد هەزار دیناری لێ دزی و لای نەوشەری مایەوە. نەوشەری پەیکی بۆ لای موقتەدری خەلیفە نارد و لەبارودۆخی یادە الله و ئەوکەسانەی لەمیسر مابوونەوە، ئاگاداری کردەوە. خەلیفە فەرمانی پێدا ئەوانەی لەمیسر ماونەتەوە، لەگەل سامانەکان ڕەوانەی بەغداد بکات و نەوشەری ئەو کارەی کرد.

زیادە الله ڕۆشت گەیشتە ڕەققە و لەوێ نامەیەکی بۆ کوڕی فوراتی وەزیر نووسی و داوای مۆلەتی ڕۆشتنە ناو بەغدادی لێکرد. کوڕی فورات داوای لێکرد چاوەڕوان بێت و ئەو بۆ ماوەی یەك سال لەوێ مایەوە. هاوەلانی بلاوەیان لێکرد و ئەو بەردەوام سەرقالی خواردنەوە و رابواردن بوو. لای موقتەدر خراپەی ئەویان هێنایە سەرزمان و فەرمانی بۆ هات کەئەو بەرەو مەغریب بڕوات و تۆلەی خۆی بستێنێتەوە. ئەم فەرمانەی بەدەست گەیشت و نامەیەکی بۆ نەوشەری ڕەوانە کرد کەبەهێز و سوپا هاوکاری بکات تا لەمیسرەوە بەرەو مەغریب بگەڕێتەوە. ئەو ڕۆشتە میسر و نەوشەری فەرمانی پێدا بەرەو زات حەمام بڕوات و لەوێ بمێنێتەوە تا توێشوو و هێزی پێویستی بەدەست بگات. ئەو کارەی کرد. نەوشەری کەمتەرخەمی و خۆی دوادەخست و مانەوەی زیادە الله لەزات حەمام زۆری خایاند. ئەو لەوێ بەردەوام نەخۆش بوو. دەلێن یەکێك لەکۆیلەکانی ژەهری دەرخوارددا و ڕیشی هەلوەڕی. زیادە الله بۆ میسر گەڕایەوە و مەبەستی بیت ئەلموقەدەسی کرد و لەرملە مرد و لەوێ بەخاك سپێردرا.

پاك و پاکیزەیە ئەو خواوەندەی هەرگیز نامرێت و فەرمانڕەوایەتییەکەی کۆتایی نایەت. چیتر کەس لەبنەمالەی ئەغلەب لەمەغریب نەمایەوە. ئەوان سەد و دوانزە سال فەرمانڕەوایەتییان کرد و بەردەوام دەیانوت: ئێمە تا میسر و شام پێشڕەوی دەکەین و ئەسپەکانی خۆمان لەباغە زەیتونەکانی فەلەستین دەبەستینەوە. بەلێ، زیادە الله رووی کردە فەلەستین بەلام بەو شێوەی ئاماژەمان

پێدا نەك بەو شێوەی خۆیان دەیانویست.

## سەرەتای هاتنە سەرکاری عەلەوییەکان لەئەفریقییە

ئەم فەرمانڕەوایەتییە فراوان و زەمانەکەی درێژەی کێشا. ئەفریقییە لەم ساڵەدا لەژێر فەرمانی عەلەوییەکاندا بوو و سەرئەنجام فەرمانڕەوایەتی ئەوان لەساڵی ١١٧١/٥٦٧ زایینی لەمیسر کۆتایی پێهات و لەسەر ئێمەیە هۆکاریەکانی باس بکەین.

یەکەم کەس لەوان هاتە سەرکار، باوکی محەممەد عوبەیدالله بوو. دەستەیەك وتوویانە ئەو هەمان محەممەد کوڕی عەبدولله کوڕی مەیمون کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە. کەسانێك کە بەم ڕەچەڵەکە رازی دەبەن ئەو بەهەمان عەبدولله کوڕی مەیمونی قەداح دەزانن کەقەداحییەکان بۆ ئەو دەگەڕێنەوە. دەستەیەك دەڵێن ئەو عوبەیدالله کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سانی کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

زاناکان لەراستی ڕەچەڵەکی ئەو ناکۆکن. خودی ئەو و باوەڕدارانی ئیمامەت ئەم ڕەچەڵەکە بەڕاست دەزانن و گومانیان نییە. ژمارەیەکی زۆر لەعەلەوییە ڕەچەڵەك ناسەکان جەخت لەم بۆچوونە دەکەنەوە. ئەم هۆنراوەی شەریفی رەزی شایەتی راستی ڕەچەڵەکی ئەوە:

| | |
|---|---|
| ما مقامی علی الهوان و عندی | مقول صارم و انف حمی |
| البس الذل فی بلاد الاعادی | و بمسر الخلیفة العلوی |
| من ابوه ابی و مولاه مولا | ی اذا ضامنی البیعد القصی |
| لف عرقی بعرقة سیدا النا | س جمیعا: محمد و علی |
| ان ذلی بذلك الجو عز | و اوامی بذلك النقع ری |

واتاکەی: مانەوەی من لەبەر ریسوایی نییە، لەگەڵ ئەوەی زمانێکم هەیە وەك شمشێر بڕندە و وەرەیەکی بەرز. لەسەرزەمینی دوژمن جل و بەرگی ریسوایی

لەبەر دەکەم کاتێك خەلیفەی عەلەوی لەمیسرە، ئەو خەلیفە کەباوکی باوکی منە و مەولای ئەو مەولای منە (سەروەری ئەو سەروەری منە). ئەو کاتەی کەکەسێك دوورە، خەلیفەی عەباسی زیان لەمن دەدات، ڕەگی من و ئەو دوو سەروەری جیهان پێکەوە گرێی داون کەمحەممەد و عەلین. لەئاوا کەشێکدا ریسوایی من ڕێزدارییە و تینویەتی من لەم زۆنکاوەدا، تێراوییە.

شەریفی ڕەزی ئەم هۆنراوەی لەترسا لەدیوانەکەی خۆی نەنوسیوە بۆ ئەوەی دەستنوسەکەی نەبێتە هۆی سەرکۆنە کرانی بەلاّم ڕاستی ئەوەی پێشتر ئاماژەم پێدا لەبەر ئەوەیە کاتێك ئەم هۆنراوە گەیشتە دەستی قادر باللە، قازی ئەبوبەکر کوڕی باقلانی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد و ئەوی بۆ لای شەریف باوکی ئەحمەدی موسەوی باوکی شەریفی ڕازی ڕەوانە کرد و ئەم پەیامەی بۆ نارد: پێگەی خۆت لای ئێمە دەزانیت و ئێمە لەسەر بنەمای هاورێیەتی و پێشینەی تۆ لەهەڵویستە پەسەند کراوەکان لەحکومەت، بەهەمان شێوە بەگەورەت دەزانین، ڕەوا نییە لەخەلیفەیەك ڕازی بیت کەمناڵەکەی تۆ ناسازگاری لەگەڵ دەکات. ئاگادار بووینەتەوە کەهۆنراوەیەکی لەو شێوەی هۆنیوەتەوە و خۆزگە دەمزانی لەکام ریسواخانەدا ژیان بەسەر دەبات، لەگەڵ ئەوەی خۆی کارگوزار و سەرپەرەستی حاجییەکانە و ئەمانەیش بەرزترینی پێگەکانن، لەکاتێکدا ئەگەر لەمیسر ژیانی بەسەر دەبرد، هاوشێوەی خەڵکانی ئاسایی دەبوو. وتەکە درێژەی کێشا و باوکی ئەحمەد سوێندی خوارد ئاگاداری ئەو بابەتە نییە.

باوکی ئەحمەد مناڵەکەی خۆی بانگ کرد و لەگفتوگۆکەی لەگەڵ ئەبوبەکر کوڕی باقلانی و پەیامەکەی خەلیفە ئاگاداری کردەوە. شەریفی ڕەزی حاشای لەوە کرد ئەوە هۆنراوەی ئەو بێت. باوکی پێی وت: بەخەتی خۆت نامەیەکی بەخشین بۆ خەلیفە بنووسە و ڕەچەڵەکی خەلیفەی میسر بەدرۆ لەقەڵەم بدە و بەدرۆزنی ناو ببە. شەریفی ڕەزی وتی: ئەو کارە ناکەم. باوکی وتی: لەوتەکانی خۆت من بەدرۆزن لەقەڵەم دەدەیت؟ وتی: تۆ بەدرۆزن لەقەڵەم نادەم بەلاّم لەدەیلەمییەکان و خەلیفەی میسر و بانگەوازکەرانی ئەوان دەترسم. باوکی وتی: لەکەسێك کە لەتۆ دوورە، دەترسیت و کەسێك تورە دەکەیت کە لەتۆ نزیکە و وتار و کرداری تۆ

بەدەستی دەگات و بەسەر تۆ و بنەماڵەکەت زاڵە!

گفتوگۆی باوك و کوڕ درێژەی کێشا و شەریف نامەکەی نەنووسی. باوکی ڕەنجا و لەکوڕەکەی تووڕە بوو و سوێندی خوارد لەگەڵ ئەو لەیەك شاردا نامێنێتەوە. کار گەیشتە ئەوەی شەریفی ڕەزی سوێندی خوارد ئەمە هۆنراوەی ئەو نییە. ئەم بەسەرهاتەمان بەو شێوەیە گێڕایەوە کەگێڕاویانەتەوە.

ڕازی نەبوونی شەریف لەنووسینی نامەی بەخشین بۆ خەلیفە و بریندار کردنی ڕەچەڵەکی عەلەوییەکانی میسر لەگەڵ ئەوەی لەخەلیفە دەترسا، نیشانەدەری ڕاستی و دروستی ڕەچەڵەکی عەلەوییەکانی میسرە.

من (نووسەر) لەدەستەیەك لەگەورەکانی عەلەوی سەبارەت بەڕەچەڵەکی خەلیفەی عەلەوی میسر پرسیارم کرد و ئەوانیش جەختیان لەراستی ڕەچەڵەکی ئەو دەکردەوە. دەستەیەك دەڵێن ڕەچەڵەکی ئەو درۆیەیەکی هەڵبەستراوە و ڕاست نییە، جیاواز لەوەی دەستەیەك ڕەچەڵەکی ئەو بۆ جوولەکەکان دەگێڕنەوە.

لەرۆژگاری خەلیفە قادر ڕەچەڵەك نامەیەکیان نووسی و ڕەچەڵەکی ئەو و منداڵەکانی ئەویان بریندار کرد. دەستەیەك لەعەلەوییەکان و ناعەلەوییەکان نووسیان گەڕاندنەوەی ڕەچەڵەکی ئەو بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناڕاستە.

ئەمانە لەم ڕەچەڵەك نامەدا، ڕەچەڵەکی خەلیفەی میسریان شێواندووە: شەریفی مورتەزا، شەریفی ڕەزی، شەریفی ڕەزی، کوڕی بەتحاوی عەلەوی، کوڕی ئەزرەقی عەلەوی، کوڕی ئەکفانی، کوڕی خزری، باوکی عەباسی ئەبیوەردی، باوکی حامید، کەشفەلی، قەدوری، سەمیری، باوکی فەزڵی نەسەوی، باوکی جەعفەری نسفی، باوکی عەبدوللە کوڕی نەعمان، فەقیهی شیعی.

ئەوانەی باوەڕیان بەراستی ڕەچەڵەکی خەلیفەی میسر هەیە، شایەتی زاناکانیان لەم ڕەچەڵەك نامەدا بەهۆی ترسی ئەوانەوە زانیوە. دەستەیەکی دیکەیش شارەزای زانستی ڕەچەڵەك ناسی نەبوون کەوتەکانی ئەوان پشتی پێ نابەسترێت.

ئەمیر عەبدولعەزیز، نووسەری کتێبی مێژووی ئەفریقییە و مەغریب، ڕەچەڵەکی خەلیفەی میسر بۆ جوولەکەکان دەگەڕێنێتەوە. ئەم لەم کتێبەدا وتەی دەستەیەك

لەگەورەکانی ئامارە پێداوە و لێکۆڵینەوە لەسەرەتای فەرمانڕەوایەتی عەلەوییەکان کردووە و لەم بارەوە درێژدادڕی خۆی نیشانداوە.

من بەپشت گوێ خستنی ئەو تۆمەتانەی عەبدولعەزیز بۆ خەلیفەی میسری هەڵدەبەستێت، ناوەرۆکی قسەکانی ئەو لێرەدا باس دەکەم:

کاتێك خواوەندی گەورە، سەروەری پێشینیان و داهاتووان، حەزرەتی محەممەد (د.خ)ی هەڵبژارد، جولەکە، مەسیحییەکان، رۆمییەکان، ئێرانییەکان و قورەیشییەکان و عەرەبەکانی دیکە بەدژواریان زانی چوونکە ئایینی محەممەدی ئاوزی ئەوانی بەبێ ئاوزی لەقەڵەمدا و ئایین و خواوەندەکانی ئەوانی سەرکۆنە کرد و بلاوەی پێکردن. ئەوان بۆ کوشتنی پێغەمبەر(د.خ) هاودەست بوون بەلاّم خواوەند ئەوی رزگار کرد و سەرکەوتنی بەسەر هەموو دوژمنەکانی پێبەخشی و هەر کەس لەوان کەخواوەند مەبەستی بوو، باوەڕی هێنا. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، دووڕوویی دەرکەوت و عەرەبەکان بۆ ئایینی رابردووی خۆیان گەڕانەوە و گومانیان کرد هاوەلاّنی پێغەمبەر(د.خ) دوای ئەو لاواز و سست دەبن، ئەبوبەکری راستگۆ، بۆ سەرخستنی دینی خواوەند تێکۆشا و موسەیلەمەی کوشت و ئاگری هەڵگەڕانەوە لەدینی دامرکاندەوە و کوفری ریسوا کرد. بارودۆخی دوورگەی عەرەبی سەقامگیر و جەنگی لەگەڵ ئێران و رۆم دەست پێکرد. کاتێك مرد، گومانیان کرد بەمەرگی ئەو ئیسلام لاواز دەبێت. ئەو عومەر کوڕی خەتابی لەجێگەی خۆی دانا و عومەر، ئێران و رۆمییەکانی ریسوا و دەستی بەسەر سەرزەمینەکانی ئەواندا گرت. ریاکاران لەگەڵ ئەبولۆلۆ یەکیان گرت و ئەو عومەر کوڕی خەتابی کوشت. ئەوان گومانیان دەکرد بەم کارەیان دەتوانن رووناکی ئیسلام بکوژێننەوە. دوای ئەو، عوسمان کوڕی عەفان هاتە سەرکار و سەرزەمین و ناوچەی زیاتر کەوتە ژێر دەستی موسوڵمانان. کاتێك ئەو کوژرا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب جێگەی گرتەوە. کاتێك دوژمنانی ئیسلام لەوەی بەزۆر لەناوی ببەن، بێ هیوا بوون، گێڕانەوەی حەدیسە درۆیینەکانیان دەست پێکرد و ئاوزە ناتەوانەکانیان لەم دینەدا گومڕا کرد. ئەم کارەیان لەگەڵ ئەو کەسانەدا بەئەنجام گەیاند کەسەرقاڵی نووسینەوەی حەدیس بوون و لەم ناوەدا بەگێڕانەوە و بریندار

کردنی ئیسلام، هەموو راستییەکانیان لەناو برد.

یەکەم کەسان کەسەرقاڵی ئەم کارە بوون، باوکی خەتاب محەممەد کوڕی باوکی زەینەب، موالی مناڵەکانی ئەسەد و باوکی شاکر مەیمون کوڕی دیسان، نوسەری کتێبی (المیزان فی نصره الزندقه) و کەسانی دیکە بوون. ئەم کەسانە بەم شێوەیە دڵی باوەڕدارانیان پڕ کرد کەهەرکام لەعیبادەت و خواپەرستییەکان ناخێکی هەیە و خواوەند لەسەر هاوەڵانی خۆی و ئەو کەسانەی ئیمامەکانیان ناسیوە، نەنوێژی فەرز کردووە نەزەکات و نەهیچ عیبادەتێکی دیکە، بەهەمان شێوە کەهیچ شتێك بۆ ئەوان بەناڕەوا نازانێت و ئەوان دەتوانن خوشك و دایکی خۆیان بکەنە هاوسەر. ئەم کوت و بەندانە بۆ هەموان دانراوە (خەڵکان بەگشتی) نەك کەسانی تایبەت.

ئەم دەستەیە بەشیعەگەری و شوێنکەوتنی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) وایان نیشاندا تا مەبەست و کردەوەکانی خۆیان بشارنەوە و رەزامەندی هەموان بەدەست بێنن. ئەوان بانگەوازکەرانی خۆیان بۆ هەموو سەرزەمینە ئیسلامییەکان رەوانە کرد و خۆیان وەك کەسانی خۆپارێز و خواپەرەست نیشان دەدا و بەم شێوەیە خەڵکانیان فریودەدا. (لەکاتێکدا خۆیان لەدڵەوە لەگەڵ وتەکانیان ناسازگار بوون) باوکی خەتاب و دەستەیەك لەهاوەڵانی لەکوفە کوژران. هاوەڵانی باوکی خەتاب پێیان وت: ئێمە لەسوپا دەترسین و باوکی خەتاب وەڵامی دانەوە: کەرەستەکانی جەنگی ئەوان کاریگەری لەسەر ئێوە دانانێت. کاتێك سوپاییەکان کوشتنی ئەوانیان دەستپێکرد، هاوەڵان بەباوکی خەتابیان وت: ئایا نەتوت کەرەستەکانی جەنگی ئەوان کاریگەری لەسەر ئێمە دانانێت؟ لەوەڵامدا وتی: ئەگەر خواوەند بەو شێوە بخوازێت (کاریگەری دابنێت) من دەتوانم چی بکەم؟

ئەوان لەهەموو سەرزەمینە ئیسلامییەکاندا بڵاو بوونەوە و چاوبەستن و فرت و یفڵ و درۆ و ئەستێرەناسی و زانستی کیمیا فێربوون. لەگەڵ هەر دەستەیەك بەو شێوەیە دەجووڵانەوە کە لەبەرژەوەندی ئەواندا بوو و لای هەموان خۆیان بەکەسانی خواپەرەست و خۆپارێز لەقەڵەم دەدا.

کوڕی دیسان کوڕێکی بوو بەناوی عەبدوللەی قەداح. کاتێك گەیشتە هەرەتی لاوی، باوکی فریودان و فرت و فێڵی فێر کرد و لەنهێنییەکانی ئەم دینە ئاگاداری

کردەوە. دواتر بوو بەکەسێکی شارەزا لەم بوارەدا.

لەکەنارەکانی کەرخ و ئیسفەهان پیاوێك دەژیا بەناوی محەممەد کوڕی حسەین. ئەو نازناوەکەی دندان و کاروبارەکانی ئەم کەنارەی هەڵدەسوڕاند و پێگەیەکی بەرزی پێبڕابوو. ڕقی لەعەرەبەکان بوو و خراپەکانی ئەوانی کۆدەکردەوە. قەداح ڕۆشتە لای و ئەوەی پێگەی ئەوی بەرز دەکردەوە، فێری کرد و پێشنیاری پێکرد مەبەستەکانی بەنهێنی بهێڵێتەوە و خۆی بەکەسێکی شیعە بناسێنێت و ژیان و ڕەچەڵەکی ئەسحابەکان بڕوشێنێت چوونکە رووشاندنی ئەوان ڕووشاندنی شەریعەتە و شەریعەت لەرێگەی ئەوانەوە بەداهاتووان گەیشتووە. دەندان، وتاردەرێکی کارامە بوو. سامانێکی زۆری پێبەخشی تا بۆ بانگەوازکەرانی ئەم ئایینە خەرجی بکات. قەداح ئەم سامانەی بۆ شارەکانی ئەهواز، بەسرە، کوفە، تاڵەقان، خوراسان و سەلمیە لەسەرزەمینی حیمس نارد و لەناو بانگەوازکەرەکانی بڵاوی کردەوە.

دواتر قەداح و دەندان هەردووکیان مردن. بۆیە بەقەداح ناویان دەبرد چوونکە ئاوی مرواری چاوەکانی دەهێنایەدەر و چاوی خەڵکانی تیمار دەکرد. کاتێك قەداح مرد، ئەحمەدی کوڕی جێگەی گرتەوە. کوڕێك بەناوی ڕۆستەم کوڕی حسەین کوڕی حوەشب کوڕی دازانی نەجار لەخەڵکانی کوفە، هاونشینی ئەحمەد بوو. ئەم دوانە مەبەستی زیارەتگاکانیان کرد. لەیەمەن پیاوێك دەژیا بەناوی محەممەد کوڕی فەزڵ. ئەو کەسێکی دەوڵەمەند و خزمەکانی لەخەڵکانی جەنەد فراوان بوون. شیعە بوو. ڕۆژێك کەبۆ زیارەت سەردانی گۆڕی حسەین کوڕی عەلی کردبوو، ئەحمەد و ڕۆستەم ئەویان بینی کەدەگریا. کاتێك لەحەرەمەکە هاتەدەر، ئەحمەد ڕۆشتەدەر و لەبەر ئەوەی گریانی ئەوی بینیبوو، تەماحی کرد و پێشنیاری ئایینەکەی خۆی پێکرد. محەممەد بەئایینەکەی رازی بوو و نەجار لەگەڵ ئەو ڕۆشتە یەمەن. ئەحمەد فەرمانی بەنەجاردا پێبەندی خواپەرەستی و خۆپارێزی بێت و پێشنیاری مەهدی بەخەڵکان بکات و بڵێت مەهدی لەم ڕۆژگارەدا و لەیەمەن دەردەکەوێت. نەجار ڕۆشتە یەمەن و لەعەدەن خێوەتی هەڵدا و لای ئەو شیعانەی بەمناڵەکانی موسا ناودەبران، مایەوە و سەرقاڵی فرۆشتنی کاڵاکانی

بوو.

ڕۆژێك منداڵەكانی موسا ڕۆشتنە لای و پێیان وت: بۆ هاتوویتە ئەم سەرزەمینە؟ ئەجار وتی: بۆ بازرگانی. وتیان: تۆ بازرگان نیت، بەڵكو نێردراوی مەهدیت و ئێمە لەكار و مەبەستی تۆ ئاگادارین. ئێمە منداڵەكانی موساین، ئەگەری هەیە ناوی ئێمەت بیستبێت. شادمان بە و شەرم مەكە چوونكە هەموان برای تۆین. ئەجار مەبەستەكەی خۆی ئاشكرا كرد و مژدەی پێدان كەدەركەوتنی مەهدی نزیكە و فەرمانی پێدان ئەسپ و كەرەستەی جەنگ كۆبكەنەوە و ئەوانی ئاگادار كردەوە كەسەردەم، سەردەمی دەركەوتنی مەهدییە و ئەو لەناو ئەوان ڕوخساری خۆی ئاشكرا دەكات.

شیعەكانی عێراق لەبەسەرهاتی ئەو ئاگادار بوونەوە و بۆ پەیوەست بوون بەو بەرێكەوتن. ژمارەیان فراوان و پێگەیان بەرز بوویەوە. هێرشیان كردە سەر دراوسێكانی خۆیان و ئەسیریان كرد و باجیان كۆكردەوە و چەندین دیاری گرانباییان بۆ منداڵەكانی عەبدوللەی قەداح ڕەوانەی كوفە كرد. منداڵەكانی عەبدوللە دوو پیاویان بۆ مەغریب ڕەوانە كردبوو یەكیان حیلوانی و ئەوی دیكەیان سوفیانی. بەو دوانەیان وتبوو: مەغریب سەرزەمینێكی نەكێڵدراوە، بڕۆن و بیكێڵن تا خاوەنی كشتوكاڵ بگات و بچێنێت. ئەو دووانە بەرێكەوتن. یەكێك لەوان لەسەرزەمینی كوتامە لەشارێك دابەزی بەناوی مەرمەجەنە. ئەوی دیكەیان لەسوق ئەلحمار (بازاری كەرەكان) خێوەتی هەڵدا. دانیشتوانی ئەم دوو سەرزەمینە خوازیاری پەیوەست بوون بەوان بوون و سامانە و دیارییە گرانباییەكان لەدەوری ئەوان كۆبوویەوە. ئەم دووانە چەندین ساڵ لەوێ مانەوە و دواتر مردن. كاتی مردنی ئەوان لەیەكەوە نزیك بوو.

## ناردنی باوکی عەبدوللەی شیعی بۆ مەغریب

باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی زەکەریای شیعی لەخەڵکانی سەنعا بوو کەڕۆشتە لای کوڕی حەوەشبی نەجار و بوو بەهاونشین و یەکێك لەهاوەڵە نزیکەکانی ئەو. ئەو کەسێکی زانا و بیرتیژ و فێڵباز بوو. کاتێك هەواڵی مردنی حیلوانی و باوکی سوفیان بەحەوەشب گەیشت، بەباوکی عەبدوللەی شیعی وت: حیلوانی و سوفیانی زەوی کوتامەیان کێڵاوە و هەنووکە مردوون وئەم زەوییە جگە لەتۆ خاوەنی نییە، خێراکە و بیکێڵە چوونکە تەخت و ئامادەیە.

باوکی عەبدوللە سەرەتا ڕۆشتە مەککە. کوڕی حەوەشب سامانێکی زۆری خستە بەردەست و عەبدوللە کوڕی باوکی مەلاحفی کردە هاوڕێی. کاتێك عەبدوللە گەیشتە مەککە، بەدوای حاجییەکانی کوتامەدا گەڕا. ئەوانیان نیشاندا. باوکی عەبدوللە لای ئەوان دانیشت و مەبەستەکەی خۆی لەوان شاردەوە. بیستی ئەوان باسی چاکەی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) دەکەن. ئەویش وەسفی بنەماڵەی پێغەمبەری کرد و سەبارەت بەوان ئەو وتانەی هێنایە سەرزمان کەپێشتر نەیانبیستبوو. کاتێك عەبدوللە هەستا بڕوات، حاجییەکان داوایان لێکرد مۆڵەتی سەردانیان پێبدات بۆ ئەوەی زیاتر بتوانن لەزانستەکەی سوود ببەن. باوکی عەبدوللە مۆڵەتی پێدان. لێیان پرسی: بەرەو کوێ دەڕوات.؟ وتی: میسر. ئەوان لەوەی دەبوونە هاوسەرفەری ئەو، شادمان بوون.

ڕێبەرانی کوتامییە لەمەککە یەکیان حورەیسی جومەیلی و ئەوی دیکەیان موسا کوڕی مەکاد بوو. ئەوان بەرێکەوتن بێ ئەوەی لەمەبەستی باوکی عەبدوللە ئاگادار بن. باوکی عەبدوللە خۆی وەك کەسێکی خواپەرەست و خۆپارێز نیشان دەدا. بەم شێوەیە بوو بەکەسێکی خۆشەویست و پێگەی لای ئەوان بەرز و کاروبارەکانیان بۆ ئەنجام دەدا. باوکی عەبدوللە سەبارەت بەسەرزەمین، هۆزەکان و فەرمانبەری ئەوان لەخەلیفەی عەباسی پرسیاری کرد. لەوەڵامدا وتیان: ئەو

فەرمانڕەوای ئێمە نییە، دووری ئێمە لەنوێنەرەکەی ئەو (کارگوزار و فەرمانڕەوای میسر) دە ڕۆژە. باوکی عەبدوللە پرسی: ئایا کەرەستەی جەنگ هەڵدەگرن؟ وتیان: ئەوە کاری ئێمەیە. ئەو بەردەوام پرسیاری لێدەکردن تا گەیشتنە میسر. کاتێك حاجییەکان ویستیان ماڵئاوایی لیٚ بکەن، لێیان پرسی: لەمیسر بەدوای چیدا دەگەڕێیت؟ وتی: دەمەوێت لەم سەرزەمینەدا خەڵکان فێری زانست بکەم. وتیان: ئەگەر خوازیاری ئەو کارەیت، سەرزەمینەکەی ئێمە باشترین شوێنە و ئێمە باشتر لەهەموان تۆ دەناسین. ئەوان بەجێیان نەهێشت و سەرئەنجام بەهۆی پێداگرتن و سووربوونی ئەوان بەداواکەیان رازی بوو.

کاتێك ئەم دەستەیە لەشارەکەیان نزیك بوونەوە، شیعەکان پێشوازییان لێکردن و موسافیرەکان ئەوانیان لەبوونی باوکی عەبدوللە ئاگادار کردەوە. ئەوان ویستیان باوکی عەبدوللە لەماڵی ئەوان دابەزێت و سەرئەنجام تیروپشکیان هەڵدا بۆ ئەوەی بزانن باوکی عەبدوللە میوانی کیٚ بێت. ئەوان ڕۆشتن و لەنیوەی رەبیع الاوەلی ٢٨٠/ شەشی جوڵای ٨٩٣ زایینی گەیشتنە کوتامە. دەستەیەك لەوان داوایان کرد باوکی عەبدوللە لای ئەوان بمێنێتەوە و بەڵێنیاندا تا سەرەمەرگ پارێزگاری لیٚ دەکەن. باوکی عەبدوللە پرسی: فەج الاخیار (دۆڵی چاکەکارن) لەکوێیە؟ ئەوان لەم پرسیارەی سەریان سوڕما چوونکە هیچ کات باسی ئەو دۆڵەیان نەکردبوو. وتیان: لەگەڕەکی مناڵەکانی سلێمانە. باوکی عەبدوللە وتی: دەڕۆینە ئەویٚ و دواتر لەشوێنەکەی خۆمانەوە دێینە لای ئێوە و لەماڵەکانی خۆتان سەردانتان دەکەین. ئەو بەم وتەیە هەموویانی رازی کرد (چوونکە دەرفەتیان دەبوو میوانداری بکەن)

ئەو ڕۆشتە کێوێك بەناوی ئەنکجان و فەج الاخیار لەویٚ بوو. وتی: ئەمە هەمان فەج الاخیار (دۆڵی چاکەکارانە) و لەبەر ئێوە بەم ناوە ناونراوە و لەگێڕانەوەکاندا هاتووە کەمەهدی بۆ ئەم سەرزەمینە دێت و لەسەرزەمینەکەی خۆی دوور دەکەوێتەوە و چاکەکارانی ئەم سەرزەمینە هاوکاری دەکەن. چاکەکاران کەناویان لەکێتمانەوە وەرگیراوە کەهەمان کوتامەیە و ئەگەر بەفەج الاخیار ناویان بردووە بەهۆی شۆڕشی ئێوەیە.

ئەم هەواڵە بەگوێی هەموو هۆزەکان گەیشت. باوکی عەبدوللە ڕێگەی فرت و

فیلی دەگرتەبەر و خەلکانی بەئاسانی گومڕا دەکرد. بەربەرەکان لەهەموو کەنارەکانەوە مەبەستی ئەویان کرد و پێگەی بەرادەیەك بەرز بوویەوە کەکوتامە بۆ پاریزگاری کردن لەو لەگەلّ بەربەرییەکان جەنگان و چەندین جار لەکوژران رزگاری بوو بێ ئەوەی تا ئەوسا ناوێك لەمەهدی ببات. زاناکان گفتوگۆیان لەگەلّ کرد و بیریان لەکوشتنی ئەو کردەوە بەلاّم خەلکانی کوتامە ریّگەیان لەگفتوگۆی ئەو دەگرت. ئەوان لەناو خۆیان بەباوکی عەبدوللەی مەشرقی ناویان دەبرد.

هەوالّی ئەو بەئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەغلەب فەرمانڕەوای ئەفریقییە گەیشت. ئەو کارگوزارەکەی خۆی لەمیلە نارد تا لەبەسەرهاتی ئەو ئاگادار ببێتەوە. کارگوزاری میلە ئەوی بەکەم بەها لەقەلّەمدا و فەرمانڕەوای ئاگادار کردەوە کەپیاوێکە جل و بەرگی زبری لەبەردایە و پێشنیاری خواپەرەستی و چاکەکاری بەخەلکان دەکات. فەرمانڕەوایش بەهۆی وتەکانی کارگوزارەکەی گرنگی پێنەدا.

لەم کاتەدا باوکی عەبدوللە بەکوتامییەکانی وت: من هەمان خاوەنی زەرعم کەباوکی سوفیان و حیلوانی بەئێوەیان وتبوو. بەم قسەیە، پێگەی ئەو لای خەلکان بەرز بوویەوە و لەنێوان بەربەرییەکان و دانیشتوانی کوتامە ناسازگاری هاتە ئاراوە و دەستەیەك بیریان لەکوشتنی ئەو کردەوە بەلاّم باوکی عەبدوللە خۆی حەشاردراوە و لەنێوان ئەم دوو دەستە جەنگێکی قورس روویدا. یەکێك لەگەورەکانی کوتامە بەناوی حەسەن کوڕی هارون ئاگادتار بوویەوە. ئەو باوکی عەبدوللەی بردە لای خۆی و پاراستی و هەردووکیان ڕۆشتنە ناسرون. لەوێ هۆزەکان لەدەوری کۆدەبوونەوە و بەم شێوەیە پێگە و جێگەی باوکی عەبدوللە بەرز بوویەوە و سەرۆکایەتی بەحەسەن کوڕی هارون گەیشت و باوکی عەبدوللە جلّەوی کاروبارەکانی بەو سپارد. دواتر مەبەستی خۆی ئاشکرا و جەنگی دەستپێکرد و تالاّنییەکانی کۆکردەوە. ئەو لەشاری ناسرون مایەوە و بەدەوری شارەکە خەندەکەی هەلّکەند. هۆزەکانی بەربەر هێرشیان کردەسەر و رووبەرووی بوونەوە بەلاّم دواتر تەقەیان لەدەرگای ئاشتیدا هەرچەند زۆری نەخایاند و ئاگری جەنگ دووبارە بلّیسەی سەندەوە. چەندین جەنگ لەنێوان ئەوان روویدا و باوکی

عەبدوللە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و سامانەکانی زەوت کرد و بەم شێوەیە بەرپەرەکان ملکەچی فەرمانەکانی خەڵکانی کوتامە بوون.

## زاڵبوونی باوکی عەبدوللە بەسەر میلە و هەلاتنی ئەو

کاتێك بارودۆخ بۆ باوکی عەبدوللە سەقامگیر بوو، رووی کردە شاری میلە. پیاوێك بەناوی حەسەن کوڕی ئەحمەد هاتە لای و ئاگاداری کردەوە خەڵکی شارەکە لەهێرشی ئەو بێ ئاگان. ئەو شەڕی لەگەڵ خەڵکی شارەکە کرد و دەستی بەسەر دەوروبەری شارەکەدا گرت. خەڵکان داوای ئەمانیان کرد و پێیان بەخشرا و باوکی عەبدوللە ڕۆشتە ناو شاری میلە. فەرمانڕەوای ئەفریقییە ئاگادار بوویەوە. لەم کاتەدا ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد فەرمانڕەوای ئەفریقییە بوو. ئەو ئەحوەلی لەگەڵ دوانزە هەزار سەرباز بۆ جەنگی باوکی عەبدوللە ڕەوانە کرد و بەم ژمارەیە هێزی هاوکاری بۆ نارد تا لەجەنگ دژی باوکی عەبدوللە هاریکاری بن. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و باوکی عەبدوللە هەلات و ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپاکەی کوژران. ئەحوەل شوێنی کەوت بەلام بارینی بەفرێکی قورس دووری لەنێوان ئەواندا دروست کرد و باوکی عەبدوللە خۆی گەیاندە کێوی ئەنکجان. ئەحوەل گەیشتە شاری ناسرون و ئاگری تێبەردا و شاری میلەی سوتاند و کەسی لەوێ نەبینی.

باوکی عەبدوللە لەئەنکجان ماڵێکی دروست کرد و هاوەڵانی مەبەستی ئەو شوێنەیان کرد. ئەحوەل بۆ ئەفریقییە گەڕایەوە. باوکی عەبدوللە دوای گەڕانەوەی ئەو گەڕایەوە و ئەوەی بەجێی هێشتبوو، تالانی کرد. لەم کاتەدا لەهەواڵی مەرگی ئیبراهیم ئاگادار بوویەوە و شادمانی خۆی نیشاندا. دواتر هەواڵی کوژرانی کوڕەکەی ئیبراهیم، باوکی عەباس و هاتنە سەرکاری زیادە اللەی پێگەیشت. پێیان وت: زیادە الله سەرتاڵی رابواردنە و ئەمە زیاتر ئەوی شادمان کرد.

ئەحوەل لەرۆژگاری باوکی عەباسی برای سوپایەکی کۆکردبوویەوە و بەهەمان سوپا بۆ جەنگی باوکی عەبدوللە ڕۆشت بەلام شکستی خوارد.

ئەحوەل و سوپاکەی لەنزیك باوکی عەبدوللە مانەوە و رێگەی پێشڕەوییان

لێگرت. کاتێك باوکی موزێر زیادە الله هاتە سەرکار، ئەحوەلی بانگ کردەوە و ئەوی کوشت. – پێشتر ئاماژەمان پێدا–. ئەحوەل خێڵ نەبوو بەڵام کاتێك زۆر سەیری شتێکی دەکرد، پێڵوەکانی دەکەوتنە سەریەك و لەبەر ئەمە بەئەحوەل ناویان دەبرد. کاتێك ئەحوەل کوژرا، سوپاکەی باوکی عەبدوللە بڵاوەیان لێکرد. باوکی عەبدوللە دەیوت: مەهدی لەم رۆژانەدا خۆی نیشان دەدات و زەوی دەخاتە ژێر فەرمانی خۆی. کەواتە خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی لەدەوری من کۆدەبێتەوە و گوێرایەڵی فەرمانی من دەبێت. ئەو خەڵکی دژی باوکی موزێر هان دەدا و عەیبەکانی ئەوی باس دەکرد.

هەموو وەزیرەکانی زیادە الله شیعە و لەسەرکەوتنی باوکی عەبدوللە ناڕاحەت نەدەبوون بەتایبەت ئەو کاتەی باسی تواناییەکانی مەهدییان دەبیست کەمردووەکان زیندوو دەکاتەوە و هەتاو لەرۆژئاوا بۆ رۆژهەڵات دەگەڕێنێتەوە و سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو هەموو زەمین دەبێت . باوکی عەبدوللە بەردەوام کەسی بۆ لای ئەوان دەنارد و بەڵێن و مژدەی دڵخۆشکەری پێ دەدان.

## چۆنیەتی پەیوەندی مەهدی عوبەیداڵلەی شیعی و ڕۆشتنی ئەو بۆ سێجلماسە

کاتێك عەبدوڵله کوڕی مەیمونی قەداح مرد، منداڵەکانی ئەو خۆیان لەپشتی عەقیل کوڕی ئەبی تالیب ناساند بەڵام ڕەچەڵەك و کاری خۆیان دەشاردەوە و کەس لەوان خۆی نەدەکرد وێردی سەرزمانی خەڵکان.

یەکێك لەمناڵەکانی ئەو ئەحمەد بوو کەباسمان کرد. ئەو مرد و محەممەدی کوڕی وەك جێگری خۆی دانا. محەممەد نامەی بۆ هەموو بانگەوازکەرەکان نووسی. محەممەد مرد و ئەحمەد و حسەینی وەك جێگری خۆی دیاریکرد. حسەین ڕۆشتە سەلەمییە لەحیمس. ئەو لەوێ خاوەنی ئەمانەت و سامانی باوەگەوڕێی عەبدوڵلەی قەداح بوو و نوێنەرەکان کاروبارەکانیان رادەپەڕاند. حسەین خاوەنی چەندین کۆیلە بوو. لەمناڵەکانی قەداح باوکی شەلغەلغ لەبەغداد مایەوە.

حسەین وای نیشاندا جێگر و هەمەکارەی باوکیەتی. بانگەوازکەرانی یەمەن و مەغریب نامەیان بۆ نووسی و پەیامەکانیان ئاڵ و گۆڕ کرد. ڕۆژێك لای ئەو باسی ژنەکانی سەلەمییە کرا و باسی ژنی پیاوێکی جوولەکەیان بۆ کرد کەمردبوو. وتیان ئەم ژنە لەترۆپکی جوانیدایە. حسەین ئەو ژنەی کردە هاوسەری خۆی. ئەم ژنە لەپیاوی ئاسنگەر خاوەنی منداڵێك بوو کەهاوشێوەی ژنەکە جوان بوو. حسەین ئەم ژنەی خۆش دەویست و پێگەی ژنەکە لای ئەو بەرز بوویەوە. حسەین منداڵی ژنەکەیشی خۆش دەویست و ئەوی پەروەردە و زانستی فێر کرد. منداڵی ژنەکە بوو بەکەسێکی زانا و پێگەی بەرز بوویەوە.

دەستەیەك لەشارەزایانی ئەم ئایینە باوەڕیان وایە کەئیمامی سەلەمییە یا هەمان حسەین مرد بێ ئەوەی منداڵی هەبێت. ئەو کاروبارەکانی خۆی بەکوڕی ئاسنگەرێکی جوولەکە بەناوی عوبەیداڵله سپارد. حسەین نهێنییەکانی ئەم ئایینەی لەوتار و کردار فێر کرد و ئەوی لەشوێنی بانگەوازکەران ئاگادار کردەوە و

سامان و نیشانەکەی بەو سپارد و فەرمانی بەهاوەڵانیدا فەرمانبەری بن و خزمەتی بکەن. ئەوی بەئیمام و جێگری خۆی ناساند و کچە مامەکەی خۆی باوکی شەلغلەغی وەك هاوسەری ئەو هەڵبژارد. ئەم وتەی باوکی قاسمی ئەبیەزی عەلەوی و دەستەیەکی دیکەیە کەئەم جوولەکە زادە لەم رێگەوە رەچەڵەکی خۆی گەڕاندەوە و بانگەشەی ئەوەی کرد عوبەیدالله کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

دەستەیەکی کەم لەخەڵکان دەڵێن: عوبەیدالله لەمناڵەکانی قەداحە. ئەم قسەیە لەگومان دوور نییە. خۆزگە دەمانزانی چ شتێك باوکی عەبدوللەی شیعی و بانگەوازکەرانی دیکەی ئەم ئایینەی ناچار کرد کارەکان لەناو خۆیان تەسلیم بەجوولەکەزادەیەك بسپێرن و ئایا کەسێك کەشوێنکەوتەی ئەم ئایینەیە دەتوانێت ئەو گومانە بکات بۆ ئەم ئایینە پاداشتی پێدەدرێت؟.

باوکی قاسمی ئەبیەزی عەلەوی دەڵێت: کاتێك حسەین کارەکانی خۆی بەعوبەیدالله سپارد، پێی وت: تۆ دوای من بۆسەرزەمینێکی دوور کۆچ دەکەیت و رووبەرووی دژواری و سەختییەکان دەبیتەوە. حسەین مرد و عوبەیدالله کاروبارەکانی لەئەستۆ گرت. ئایینەکەی ئەو لەهەموو ناوچە ئیسلامییەکان بلاو بوویەوە و بەپێچەوانەی کەسانی پێش خۆی سامانێکی زۆری لەناو خەڵکدا بەخشییەوە. باوکی عەبدوللە چەند کەسێکی لەکوتامەوە بۆ لای ئەو نارد و لەسەرکەوتنەکانی خۆی، عوبەیداللەی ئاگادار کردەوە و پەیامیدا کەهەموان چاوەڕوانی هاتنی ئەون.

لەرۆژگاری موکتەفی ئایینەکەی ئەو بلاو بوویەوە. شوێنی کەوتن بەلام لەگەڵ کوڕەکەی خۆی باوکی قاسمی نزار کەدوای ئەو هاتە سەرکار، هەڵاتن. باوکی قاسم هێشتا نەوجەوان و نازناوی قائیمی لەخۆی نا. عوبەیدالله لەگەڵ موالی و کەسە نزیکەکانی خۆی رێگەی مەغربی گرتەبەر. رۆشتنی ئەو لەرۆژگاری زیادە الله بوو. کاتێك گەیشتە میسر، لەناو جل و بەرگی بازرگانەکان خۆی شاردەوە. فەرمانڕەوای میسر لەو کاتەدا عیسای نەوشەری بوو. نامەی خەلیفەی بەدەست

گەیشت کەکەسێکی لەو شێوە بەو نیشانەنانە لەوێیە، خەلیفە فەرمانی بەنەوشەریدا عوبەیدالله یا هەرکەسێکی هاوشێوەی ئەو بگرێت. یەکێك لەنزیکەکانی عیسا شیعە بوو. ئەو مەهدی یا هەمان عوبەیداللەی ئاگادار کردەوە و پێشنیاری گەڕانەوەی پێکرد. عوبەیدالله لەگەڵ هاوەڵانی میسریان بەجێهێشت. عوبەیدالله سامانێکی فراوانی پێبوو و هەرکەس هاورێیەتی دەکرد، لەم سامانەی پێدەبەخشی. کاتێك نامەی خەلیفە بەنەوشەری گەیشت، سەربازەکانی خۆی بۆ گرتنی عوبەیدالله نارد و خۆیشی شوێنپێی هەڵگرت و خۆی پێگەیاند. کاتێك عوبەیداللەی بینی، گومانی نەکرد و قۆڵبەستی کرد. عوبەیداللەی بردە باخێك و چەندین پاسەوانی بۆ دانا. کاتێك خواردنیان هێنا، ئەوی بۆ خواردن بانگ کرد. عوبەیدالله وتی: بەڕۆژووم. نەوشەری بەزەیی پیایدا هاتەوە و وتی: راستی کارەکانی خۆتم بۆ باس بکە تا ئازادت بکەم. عوبەیدالله، نەوشەری لەخواوەند ترساند و فەرمانبەری ئەوی بۆ خەلیفە بەکارێکی قێزەون لەقەڵەمدا. بەرادەیەك نەوشەری ترساند کەئازادی کرد و رێگەی بۆ کردەوە و ویستی کەسانێك بکاتە هاورێی تا هاوکاری بکەن. عوبەیدالله وتی: پێویست بەو کارە ناکات و بۆ نەوشەری پاڕایەوە.

دەستەیەك دەڵێن: عوبەیدالله پارەی بەنەوشەریدا و نەوشەری رێگەی بۆ کردەوە و دەستەیەك لەهاوەڵانی نەوشەری بۆ ئەم کارە سەرکۆنەیان کرد و نەوشەری لەرزگار کردنی عوبەیدالله پەشیمان بوویەوە و ویستی سوپایەك بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ڕەوانە بکات. کاتێك مەهدی پەیوەستی هاوەڵانی خۆی بوویەوە، باوکی قاسمی کوڕی خۆی بینی کەسەگی راوچی ئەوی ون کردووە و بۆی دەگریت. کۆیلەکان پێیان وت سەگەکەیان لەناو باخەکەدا بەجێهێشتووە. مەهدی بۆ گرتنی سەگەکە گەڕایەوە و لەگەڵ کۆیلەکانی خۆی ڕۆشتە ناو باخەکە. نەوشەری ئەوانی بینی و لەهۆکاری گەڕانەوەیان پرسیاری کرد. کۆیلەکان وتیان: عوبەیدالله بۆ دۆزینەوەی سەگەکەکی خۆی گەڕاوەتەوە. لەم کاتەدا نەوشەری بەهاوەڵانی خۆی وت: خواوەند روخسارتان قێزەون بکات، دەتانویست ئەم پیاوە بگرم و خوێنی برێژم. ئەگەر بەو شێوە دەبوو کەئێوە دەیڵێن و باوەڕی

بەئاییینەکەی خۆی نەدەبوو، تا ئێستا چەندین مەنزڵ دوور کەوتبوویەوە و خۆی لەئێوە حەشاردابوو و بۆ هەڵگەڕتنەوەی سەگەکەی نەدەگەڕایەوە.

دواتر مەهدی لەهەڵاتن خێرایی لەخۆی نیشاندا و لەتاحونە، دزەکان ڕێگەیان لێگرت و کاڵاکانی ئەویان دزی. چەندین کتێبی پێبوو کەبەسەرهاتی باوباپیرانی تیا تۆمار کرابوو. دزەکان کتێبەکانیشان فڕاند. عوبەیداللە خەمبار بوو. دەستەیەك وتوویانە کاتێك مناڵەکەی باوکی قاسم بۆ یەکەم جار بەرەو میسر بەرێکەوت، ئەم کتێبانەی لەویَ بینی.

مەهدی و مناڵەکەی ڕۆشتنە شاری تەرابلوس و لەویَ بازرگانەکانی هاورێی لێی جیابوونەوە. باوکی عەباس برای باوکی عەبدوڵلەی شیعی هاورێیەتی ئەوی دەکرد. مەهدی ئەوی لەگەڵ هەندێ کەل و وپەل و کاڵا بۆ قیروان نارد و فەرمانی پێدا بڕواتە کوتامە. کاتێك باوکی عەباس گەیشتە قیروان، بینی پێشتر زیادە الله لەهەواڵ و بەسەرهاتی مەهدی ئاگادار بۆتەوە و دوای پرسیار کردن بۆیان دەرکەوتووە مەهدی لەتەرابلوس ماوەتەوە و باوکی عەباسی هاورێی لەقیروانە. بەم شێوەیە باوکی عەباسیان گرت و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کرد. بەڵام باوکی عەباس لەوەڵامدا وتی: بازرگانم کە لەکاتی گەڕانەوەدا بوومەتە هاورێی پیاوێك. ئەویان زیندانی کرد.

مەهدی لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە و ڕێگەی قەستەلیەی گرتەبەر. نامەی زیادە الله بەکارگوزاری تەرابلوس گەیشت کەفەرمانی گرتنی مەهدی تیا نووسرابوو. مەهدی پێشتر کارگوزاری بینیبوو و چەندین خەڵاتی پێبەخشیبوو. کارگوزار نامەیەکی بۆ زیادە الله نووسی و ڕایگەیاند مەهدی لەتەرابلوس ڕۆشتووە و نەیتوانیوە بیگرێت. کاتێك مەهدی گەیشتە قەستەلیە، لەڕۆشتن بۆ لای باوکی عەبدوڵلەی شیعە چاوپۆشی کرد چوونکە باوکی عەباسی برای دەستبەسەر کرابوو. ئەو دەیزانی ئەگەر بڕواتە لای باوکی عەبدوڵلە، بەدوایدا دەگەڕێن و خوێنی دەرێژن. ئەو لەقەستەلیە ڕوویکردە سێجلماسە و لەویَ مایەوە. لەرێگەدا، سیخوڕەکان هاورێیەتیان دەکرد.

فەرمانڕەوای سێجلماسە پیاوێك بوو بەناوی ئەلیەسع کوڕی میدرار. مەهدی

دیاری بۆنارد و پەیوەندی لەگەڵ بەست. ئەلیەسع ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و خۆشەویستی خۆی نیشاندا. لەم کاتەدا نامەی زیادەاللەی بەدەست گەیشت و ئاگاداری کردەوە کەمەهدی ئەو کەسەیە باوکی عەبدوللەی شیعە بانگەوازی بۆ دەکات. ئەلیەسع مەهدی گرت و زیندانی کرد. ئەو لەزیندان مایەوە تا – دواتر ئاماژەی پێدەدەین– باوکی عەبدوللە لەزیندان ئازادی کرد.

## زاڵبوونی باوکی عەبدوللە لەئەفریقییە و هەڵاتنی فەرمانڕەواکەی، زیادە الله

پێشتر باسی چۆنیەتی کارەکانی باوکی عەبدوللەمان کرد. کاتێك زیادە الله زاڵبوونی باوکی عەبدوللەی لەمەغریب و گرتنی شارەکانی میلە و سەتیف و شارەکانی دیکە بینی، سوپای کۆکردەوە و سامانێکی زۆری بەخشییەوە و ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپاییەکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو، ئیبراهیم کوڕی خونەیشی وەك فەرماندەی ئەم سوپایە دیاری کرد کەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی بوو. ئیبراهیم شارەزای هونەری جەنگ نەبوو. ژمارەی ئەم سوپایە دەگەیشتە چل هەزار کەس. زیادە الله توێشو و توانی پێویستی خستە بەردەستی ئیبراهیم. لەئەفریقییە هیچ جەنگاوەرێك نەما هاورێیەتی ئەم سوپایە نەکات. ئیبراهیم بەرێکەوت و لەرێگە ئەم ئەندازەیە سەرباز پەیوەستی بوو. کاتێك گەیشتە قەستینە ئەلهەوا کەشارێکی دەورەگیراو بوو، ئوردووی لێدا و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی کوتامە کەملکەچی فەرمانەکانی باوکی عەبدوللە نەبوون، پەیوەستی بوون. ئیبراهیم لەسەر رێگەکەی ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی باوکی عەبدوللەی کوشت و باوکی عەبدوللە و خەڵکانی کوتامە ترسی ئەویان کەوتە دڵەوە. ئیبراهیم شەش مانگ لەقەستینە مایەوە. لەم ماوەدا باوکی عەبدوللە لەکوێستانەکان خۆی حەشاردابوو.

کاتێك ئیبراهیم بینی باوکی عەبدوللە بۆ جەنگی ئەو نایەت، خۆی پێشدەستی کرد و سوپاکەی بردە شارێك بەناوی کەرمە. باوکی عەبدوللە سوپایەکی

هەڵبژاردەی بۆ جەنگی ئەو نارد تا هێز و توانای ئەو تاقیبکاتەوە. ئەم سوپایە گەیشتە کەرمە و کاتێك ئیبراهیم سوپاکەی بینی، خۆی مەبەستی جەنگی ئەوانی کرد و هیچ کام لەسوپاییەکان هاورێیەتییان نەکرد. هێشتا باری سوپاییەکان لەپشتی چوارپێکان دانەگیرابوو، جەنگ دەستی پێکرد و ئاگرەکەی بڵێسەی سەند.

هەواڵی جەنگەکە بەباوکی عەبدوللە گەیشت و ئەو، لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و شکستیان بەئیبراهیم و سوپاکەی هێنا. ئیبراهیم بریندار بوو، ئەسپەکەی کوژرا و سوپاکەی بلاوەی لێکرد و هەموو کالاکانیان بەجێهێشت. باوکی عەبدوللە ئوردووگاکەی تالان و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت. ئیبراهیم پەنای بردە قیروان و سەرزەمینی ئەفریقییە نائارام بوو. پێگەی باوکی عەبدوللە بەرز بوویەوە و فەرمانڕەوایەتی کەوتەدەست. باوکی عەبدوللە نامەیەکی بۆ مەهدی لەسێجلماسە نووسی ومژدەی سەرکەوتنی پێدا. ئەو نامەکەی بەیەکێك لەکەسە بڕواپێکراوەکانی خۆیدا. نێردراو لەجل و بەرگی قەسابێکی گۆشت فرۆش ڕۆشتە ناو زیندان و خۆی گەیاندە مەهدی و نامەکەی پێدا.

باوکی عەبدوللە بەرەو شاری تونبە بەرێکەوت و گەمارۆی خستەسەر. دیوارکوتەکانی جێگیر کرد و دیوارەکەی ڕووخاند. باوکی عەبدوللە شارەکەی گرت. پێشەنگەکانی شارەکە بەرگرییان کرد بەڵام باوکی عەبدوللە گەمارۆی خستنەسەر. ئەوان داوای ئەمانیان کرد و باوکی عەبدوللە ئەمانی بەوان و شارۆمەندان بەخشی و لەوێوە ڕوویکردە بەلزەمە. ئەو چەندین جار گەمارۆی خستبووە سەر ئەم شارە بەڵام نەیدەتوانی بیگرێت بەڵام ئەمجارە بارودۆخی لەدانیشتوانی شارەکە دژوار کرد و بۆ گرتنی شارەکە هەوڵیدا. دیوارکوتەکانی جێگیر کرد و بەئاگر هاوێژەکان شارەکەی سوتاند و بەزۆری شمشێر دەستی بەسەردا گرت. دواتر دیواری شارەکەی رووخاند.

زیادەالله لەسەرکەوتنەکانی باوکی عەبدوللە ئاگادار بوویەوە. دەستی بەکۆکردنەوەی سەربازەکان کرد و توانی سوپایەکی دوانزە هەزار کەسی کۆبکاتەوە و هارون کوڕی تونبی کردە فەرماندەی ئەوان و بەرێکەوت. ژمارەیەکی

زۆر لەخەڵکان پەیوەستی بوون. هارون مەبەستی شاری دارملوکی کرد کەدانیشتوانەکەی گوێرایەڵی خۆیان بۆ فەرمانەکانی باوکی عەبدولله نیشاندابوو. ئەو قەڵای شارەکە گرت و لەرێگەی رووبەرووی سوپایەکی باوکی عەبدولله بوویەوە کەبۆ هەڵسەنگاندنی هێزی ئەوان هاتبوون. کاتێك سەربازەکانی هارون سوپاکەیان بینی، ترسان و دەنگیان بەرز کردەوە و بێ هیچ جەنگێك هەڵاتن. سوپاکەی باوکی عەبدولله ئەم هەڵاتنەیان بەفریو لەقەڵەمدا بەڵام کاتێك زانیان ئەوان لەترسا هەڵاتوون، دەستیان بۆ شمشێر برد و ژمارەیەکی بەرچاویان لەسوپاکەی هارون کوشت. هارون، فەرماندەی سوپاکە، کوژرا و باوکی عەبدولله بێ جەنگ دەستی بەسەر شاری تیجسدا گرت. ئەم سەرکەوتنە بۆ زیادەالله کوشەندە بوو. دووبارە دینار و درهەمی بەکار برد و سوپایەکی کۆکردەوە و ئەمجارە خۆی بۆ جەنگی باوکی عەبدولله بەرێکەوت و لەساڵی ٢٩٥/ ٩٠٨ زایینی گەیشتە ئوربوس. گەورەکانی دەوڵەت پێیان وت: تۆ خۆت فریو دەدەیت چوونکە ئەگەر بەسەر تۆدا سەرکەوێت، چیتر ئێمە پەناگەیکمان دەست ناکەوێت و باشترە بۆ شوێنی فەرمانڕەوایی خۆت بگەڕێیتەوە و سوپا لەگەڵ کەسێکی بڕواپێکراوی خۆت ڕەوانە بکەیت، ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، دەگەڕێنەوە بۆ لای تۆ و ئەگەر شکستمان خوارد، تۆ پەناگەی ئێمە دەبیت.

زیادەالله ئەو کارەی کرد و گەڕایەوە. سوپاکەی پێشڕەوی کرد. ئەو پیاوێك لەکوڕە مامەکانی خۆی بەناوی ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب وەك فەرماندەی سوپاکە هەڵبژارد کەپیاوێکی بوێر بوو. باوکی عەبدولله ئاگادار بوویەوە. خەڵکانی باغایە نامەیان بۆ باوکی عەبدولله نووسی و ملکەچی خۆیان نیشاندا. باوکی عەبدولله بەرێکەوت و کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە، کارگوزارەکەی بۆ ئوربوس هەڵات. باوکی عەبدولله ڕۆشتە ناو شارکە و سوپاکەی لەوێ بەجێهێشت و خۆی بۆ ئەنکجان گەڕایەوە. زیادەالله ئاگادار بوویەوە و زیاتر لەجاران خەمبار بوو. زیادەالله قەشمەرێك هاورێیەتی دەکرد کەدەبووە هۆی پێکەنینی ئەو. لەم کاتەدا بەزیاد اللەی وت: سەرورەرم! هۆنراوەیەکەم هۆنیوەتەوە، فەرمان بەگۆرانیبێژێك بدە بەئاهەنگەوە بیخوێنێت و خۆت مەی بخۆوە و ئەم خەمە پشتگوێ بخە. زیادە الله

وتی: چ هۆنراوەیەك؟ قەشمەر بەگۆرانیبێژەکانی وت: هۆنراوەکەی من بخوێننەوە و دوای هەر بەندێك بڵێن: اشرب و اسقینا من القرن یكفینا. واتاکەی: مەی بخۆ و دەرخواردی ئێمەی بدە چوونکە لەرکەبەر بێ نیازمان دەکات. کاتێك گۆرانیبێژەکان دەستیان پێکرد، زیادەالله هاتە جۆش و خواردنەوەی دەست پێکرد و لەخواردن و خواردنەوە و مێبازی زێدەڕۆیی کرد. کاتێك هاوەڵانی ئەمەیان بینی، لەکارەکانی (خواردنەوە و مێبازی) هاورێیەتیان کرد.

باوکی عەبدوڵله هێرشی کردە سەر شاری مەجانە و بەزۆر دەستی بەسەردا گرت و فەرمانڕەوای شارەکەی کوشت. سوپایەکی دیکەی بەرەو شاری تیفاش نارد و ئەو شارەیشی خستە ژێر فەرمانی خۆی. ئەمانی بەدانیشتوانەکەی بەخشی و خۆی بەرەو مسکیانە و لەوێوە بەرەو تێبسە و دواتر شاری مودبیرە رۆشت کەخەڵکی قەسری ئەفریقی و شاری مەرمەجنە و مەجانە و تێکەڵەیەك لەخەڵکە جۆراوجۆرەکان لەوشارەدا کۆببوونەوە. لەکەنار شارەکە ئوردووی لێدا و جەنگی دەستپێکرد بەڵام لەناکاو نەخۆشییەکەی (بەردی میزەڵدان) دەستی پێکردەوە و ئەوی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد. خەڵکانی مودبیرە داوای ئەمانیان کرد و دەستەیەك لەسوپاییەکان ئەمانیان پێبەخشین. دانیشتوانی شار، دەروازەکانیان کردەوە و سوپای باوکی عەبدوڵله ڕۆشتە ناو شارەکە و کوشتار و تاڵان کردنیان دەست پێکرد.

باوکی عەبدوڵله ئاگادار بوویەوە و ئەم کارەی پەسەند نەکرد. لەوێ ڕۆشت و لەقێسرینی قەمودە ئوردووی لێدا. خەڵکی ئەو ناوچە داوای ئەمانیان کرد و پێی بەخشین. ئیبراهیم کوڕی باوکی ئەغلەب، فەرماندەی ئەو سوپایەی زیادە الله ڕەوانەی کردبوو، ئاگادار بوویەوە کەباوکی عەبدوڵله مەبەستی هێرش کردنە سەر زیادە اللەی هەیە لەرەقادە. زیادە الله سوپایەکی ئەوتۆی لەگەڵدا نەبوو و لەبەر ئەمە ڕێگەی ئوربوسی گرتەبەر و لەدەردمین ئوردووی لێدا. باوکی عەبدوڵله سوپایەکی بۆ دەردمین ڕەوانە کرد و لەنێوان ئەم سوپایە و سوپاکەی زیادەالله شەڕ کەوتەوە. دەستەیەك لەهاوەڵانی باوکی عەبدوڵله کوژران و ئەوانی دیکە هەڵاتن. باوکی عەبدوڵله کەچاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەم سوپایە بوو و لەدرەنگ

گەڕانەوەی ئەوان خەمبار، خۆی لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و رووبەرووی سوپا هەڵاتووەکەی بوویەوە. کاتێك سەربازە هەڵاتووەکان باوکی عەبدوللەیان بینی، ورەیان بەدەست هێنا و گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی ئیبراهیم و دەستەیەك لەسەربازەکانیان کوشت تا ئەوەی تاریکی شەو ئەوانی جیا کردەوە.

باوکی عەبدولله رووی کردە قەستەلیە و گەمارۆی خستە سەر شارەکە. دانیشتوانی ئەو شارە بەرگرییان کرد بەڵام سەرئەنجام داوای ئەمانیان کرد و باوکی عەبدولله پێی بەخشین. ئەو لەم شارەدا دەستی بەسەر توێشوو و توانای زیادالله گرت و رووی کردە قەفەسە. خەڵکانی ئەو دیارەیش داوای ئەمانیان کرد و پێیان بەخشرا. باوکی عەبدولله بۆ باغایا گەڕایەوە و لەوێ سوپایەکی بەجێهێشت و بۆ کوێستانی ئەنکاجا گەڕایەوە.

ئیبراهیم کوڕی باوکی ئەغلەب لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو باغایە بەرێکەوت و گەمارۆی خستەسەر. باوکی عەبدولله ئاگادار بوویەوە. سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و بەخێرایی رێگەی باغایەی گرتەبەر. ئەو دوانزە هەزار سواری وەك پێشەنگ رەوانە کرد وفەرمانی بەفەرماندەکەیاندا رووبکاتە باغایە و ئەگەر بینی ئیبراهیم رۆشتووە رێگە نەدات لەدۆڵی عەرعار تێپەڕێت. سوپاکەی بەرێکەوت و هاوەڵانی باوکی عەبدولله کە لەباغایە بوون، لەگەڵ سوپاکەی ئیبراهیم جەنگابوون. کاتێك ئیبراهیم و سوپاکەی سەرسەختی و پێداگری سوپاکەی باوکی عەبدوللەیان بینی، سەریان سوڕما و ئەمە بووە هۆی نەمانی ورەی ئەوان و کاتێك هەواڵی نزیك بوونەوەی سوپاکەی باوکی عەبدوللەیان بیست، ئیبراهیم پاشەکشێی بەسوپاکەی کرد. سوپاکەی باوکی عەبدولله گەیشت و کەسێ لەوێ نەبینی. سامانەکانی تاڵان کرد و گەڕایەوە.

ئیبراهیم بۆ ئوربوس گەڕایەوە. کاتێك بەهار دەستی پێکرد، باوکی عەبدولله سوپاکەی خۆی کۆکردەوە. ژمارەی سەربازەکانی بەسوار و پیادە دەگەیشتە دووسەد هەزار کەس. سوپاکەی زیادە الله لەئوربوس پەیوەستی سوپاکەی ئیبراهیم بوو. نەدەتوانرا ژمارەی سەربازەکانی بخەملێنرێت. باوکی عەبدولله لەسەرەتای جومدای الاخرەی ٢٩٦/ بیست و پێنجی فەوریەی ٩٠٩ زایینی

پێشڕەوی کرد. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕێکی مەترسیداریان دەستپێکرد. ئەم جەنگە درێژەی کێشا و سوپاکەی زیادەاللە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. کاتێك باوکی عەبدوللە ئەمەی بینی، شەششەد پیادەی لەناو سوپاکەی هەڵبژارد و فەرمانی پێدان لەپشتەوە هێرش بکەنەسەر سوپاکەی زیادە اللە. ئەم سەربازانە لەو ڕێگەوە ڕۆشتن کەباوکی عەبدوللە بۆی دیاریکردبوون. سەرنج راکێش ئەوەی ئیبراهیمیش ئەم فەرمانەی بەژمارەیەك لەسوپاکەیدابوو و بەم شێوەیە ئەم دوو دەستەیە رووبەرووی یەکبوونەوە. سوپاکەی ئیبراهیم شکستی خوارد و هەڵاتن. لەناو سوپاکەی ئیبراهیم ئەم دەنگۆیە بڵاو بوویەوە کەباوکی عەبدوللە بۆسەی ناوەتەوە و ئەمە بووە هۆی هەڵاتنی سوپاکەی زیادەاللە. هەر تیرەیەك روویکردە سەرزەمینی خۆی و ئیبراهیم و دەستەیەك لەهاوەڵانی پەنایان بۆ قیروان برد. سوپاکەی باوکی عەبدوللە شوێن هەڵاتووان کەوتن و دەیانکوشت و ئەسیریان دەکرد و سامان و چوارپێکانیان وەك تاڵانی کۆدەکردەوە. سوپاکەی باوکی عەبدوللە ڕۆشتنە ناو ئوربوس و ژمارەیەکی زۆریان کوشت. دەستەیەك لەدانیشتوانی ئەم شارە پەنایان بۆ مزگەوتی گەورەی شارەکە برد و لەو مزگەوتەدا زیاتر لەسێ هەزار کەسیان کوشت. سوپاکەی باوکی عەبدوللە بەتەواوی شارەکەی تاڵان کرد. ئەم جەنگە لەکۆتاییەکانی جومادی الاخرە/ فەوریە هەڵگیرسا و باوکی عەبدوللە بۆ قەمودە گەڕایەوە.

کاتێك زیادەاللە لەشکستی ئیبراهیم ئاگادار بوویەوە، بۆ میسر هەڵات و سەرئەنجامی ژیانی ئەوە بوو کەپێشتر باسمان کرد. بەهەڵاتنی زیادەاللە دانیشتوانی رەقادە شەوانە بۆ میسری کۆن و قیروان و سوسە هەڵاتن. خەڵکانی قیروان هاتنە رەقادە و شارەکەیان تاڵان کرد. زۆردارەکان یەخەی بێهێزەکانیان گرت و کۆشکی منداڵەکانی ئەغلەب تاڵان کرا. ئەم تاڵان و بڕەوە شەش ڕۆژ درێژەی کێشا.

ئیبراهیم کوڕی ئەغلەب گەیشتە قیروان و مەبەستی کۆشکی فەرمانڕەوای شارەکەی کرد. خەڵکی قیروان لەدەوری کۆبوونەوە و ئەو ئەمانی بەخەڵکان بەخشی و ئەوان هێور بوونەوە. بارودۆخی زیادەاللەی بۆ باس کردن و باسی

لەکردەوەکان و لەناوبردنی فەرمانڕەوایەتی منالەکانی ئەغلەبی لەسەر دەستی ئەو کرد. ئیبراهیم کارەکانی باوکی عەبدوللەی شیعی بەکەم بەها لەقەڵەمدا و بەڵێنی پێدان تۆڵەی ئەوان لەعەلەوییەکان بستێنێتەوە و سنورەکەیان دەپارێزێت. ئیبراهیم داوای لێکرد ملکەچی فەرمانەکانی بن و بەسامانی خۆیان هاوکاری بکەن. وتیان: ئێمە دەستەیەك فەقێ، مسکێن و بازرگانین، نەسامانێکی ئەوتۆمان هەیە تۆ بەمەبەستەکەت بگەیێنێت نەتوانای جەنگمان هەیە. ئیبراهیم فەرمانی پێدان لەکۆشك بڕۆنەدەر. کاتێك ڕۆشتن و کەسانی دیکەیان لەوتوێژەکەی خۆیان ئاگادار کردەوە، دەنگیان بەرز کردەوە: لەناو ئێمە بڕۆ چوونکە ملکەچی فەرمانەکانی تۆ نابین. جوێنبارانیان کرد و ئیبراهیم لەکاتێکدا بەردباران دەکرا، قیروانی بەجێهێشت.

باوکی عەبدوللە لەسەبیبە لەهەڵاتنی زیادەاللە ئاگادار بوویەوە. بەرێکەوت و لەوادی ئەلنەمل ئوردووی لێدا و عروبە کوڕی یوسف و حەسەن کوڕی باوکی خێنزیری لەگەڵ هەزار سوار بۆ رەقادە نارد. ئەوان بنیان خەڵکان سەرقاڵی کۆکردنەوەی تالانین. سوارەکان ئەمانیان بەخەڵکان بەخشی و زیانیان لەکەس نەدا و مۆڵەتیان پێدان تالانییەکان لەگەڵ خۆیان ببەن. ئەوان ڕۆشتنە قیروان و باوکی عەبدوللەیان لەچەند و چۆنی کارەکە ئاگادار کردەوە. دانیشتوانی قیروان شادمان بوون.

فەقیە و گەورەکانی شار سەردانی باوکی عەبدوللەیان کرد و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا و پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانیان لێکرد. باوکی عەبدوللە بەنەرم و نیانی وەڵامی دانەوە و ئەمانی پێبەخشین. کردەوەکانی ئەو رەزامەندی ئەم دەستەی لێکەوتەوە. ئەوان سەرکۆنەی زیادەاللەیان کرد و خراپەکانی ئەویان هێنایە سەرزمان. باوکی عەبدوللە پێی وتن: زیادەاللە بەهێزێك بوو نەشیاو بۆ شکست لەگەڵ حکومەتێکی بەرفراوان کە لەبەرگری کردن کەمتەرخەمی نەکرد بەلام چارەسەری ویستی خواوەندی پێ ناکرێت و کەس ناتوانێت بەرگری بکات. ئەوان سەریان لەم وتەیە سوڕما و بۆ قیروان گەڕانەوە.

باوکی عەبدوللە لەرۆژی شەممە، سەرەتای رەجەبی ساڵی ٢٩٦/ بیست و

شەشی مارسی ۹۰۹ زایینی هاتە ڕەقادە و لەیەکێك لەکۆشکەکاندا نیشتەجێ بوو.ماڵەکانی لەناو کوتامییەکاندا دابەش کرد چوونکە کەس لەناو ماڵەکاندا نەمابوویەوە. باوکی عەبدوللە فەرمانیدا بانگی ئەمان بەرز بکەنەوە و هەموو خەڵکی ڕەقادە بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. بۆ هەموو ناوچەکان کارگوزارەکانی دیاری کرد و خراپەکارانی گرت و فەرمانیدا سامان و کەرەستەکانی جەنگی زیادەالله کۆبکەنەوە. بەشێکی زۆری سامانی زیادەالله کۆکرایەوە. سەدان کەنیزی جوان لەناویاندا دەبینرا. باوکی عەبدوللە بەدوای کەسێکدا دەگەڕا کاروباری تایبەت بەم کەنیزانە بەو بسپێرێت. ژنێکی چاکەکاریان پێناساند کەپێشتر لای زیادەالله بوو. باوکی عەبدوللە ئەوی بانگ کرد و فەرمانی پێدا کاروباری تایبەت بەکەنیزەکان لەئەستۆ بگرێت و هەموو پێداویستییەکانی بۆ دەستەبەر کرد. باوکی عەبدوللە سەیری هیچ کام لەکەنیزەکانی نەکرد.

لەرۆژی هەینی، لەقیروان و ڕەقادە فەرمانی خوێندنەوەی وتاریدا بێ ئەوەی ناوی کەس (وەك پێشەوا، خەلیفە یا فەرمانڕەوا) ببەن. فەرمانی لێدانی سککەی دەرکرد. هیچ ناوێك بەسەر سککەکانەوە نەدەبینرا لەجیاتی ناو لەروویەکی سککەکان (بلغت حجة الله) و لەرووەکەی دیکە (تفرقة اعداءالله) دەبینرا. لەسەر کەرەستەکانی جەنگ (عدة فی سبیل الله) و لەسەر رانی چوارپێکان (الملك الله) دیاردەکەوتن. ئەو، وەك هەمیشە کۆنەپۆش و جل و بەرگی زبری لەبەر دەکرد و کەمی دەخوارد.

## ڕۆشتنی باوکی عەبدوللە بۆ سێجلماسە و دەرکەوتنی مەهدی

کاتێك بارودۆخ بۆ باوکی عەبدوللە لەشاری ڕەقادە و شارەکانی دیکەی ئەفریقییە سەقامگیر بوو، باوکی عەباسی برای هاتە لای. باوکی عەباس برا گەورەی باوکی عەبدوللە بوو. باوکی عەبدوللە لەڕەمەزان/ مەی ئەم ساڵە لەڕەقادە ڕۆشت و براکەی باوکی عەباس و باوکی زاکی وەك جێگری خۆی لەئەفریقییە دەستنیشان کرد. سەراسەری مەغریب لەپێشڕەوی سوپاکەی ئەو ترسان. خەڵکی زەناتە ترسان و هەموو هۆزەکانی سەر ڕێگە خۆیان لەباوکی عەبدوللە بەدوور گرت و پەیکان نارد و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا.

کاتێك باوکی عەبدوللە لەسێجلماسە نزیك کەوتەوە و ئەلیەسع کوڕی میدرار، فەرمانڕەوای سێجلماسە لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، کەسی بەدوای مەهدیدا نارد کەلای ئەو زیندانی بوو (پێشتر ئامارژەمان بەچەند و چۆنیەتی گرتنی ئەودا) و پرسیاری ڕەچەڵەکی لێکرد. ئەلیەسع پرسی ئایا باوکی عەبدوللە بۆ ڕزگار کردنی ئەو دێت؟ مەهدی سوێندی خوارد کەباوکی عەبدوللەی نەبینوە و نایناسێت و خۆی بەپیاوێکی بازرگان لەقەڵەمدا. ئەویان لەژوورێکدا زیندانی کرد. بەهەمان شێوە باوکی قاسمی کوڕی مەهدیان لەژوورێکی دیکەدا زیندانی کرد و پاسەوانیان بۆ دانان. لێکۆڵینەوەیان لەکوڕەکەی مەهدی کرد و ئەویش وتەکانی باوکی هێنایە سەرزمان. لەکەسانی هاوڕێی ئەوان پرسیاریان کرد و هەمان وەڵامیان دەستکەوت.

باوکی عەبدوللە لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە. پەیکی بۆ لای ئەلیەسع نارد و خۆشەویستی خۆی نیشاندا و وای نیشاندا مەبەستی جەنگی لەسەردا نییە و دەخوازێت لەبابەتێکی گرنگ ئاگاداری بکاتەوە. ئەلیەسع نامەی باوکی عەبدوللەی فڕێدا و نێردراوەکەی کوشت. باوکی عەبدوللە لەترسی ئەوەی نەکا مەهدی بکوژرێت، دووبارە ڕێگەی سازان و خۆشەویستی گرتەبەر و ناوی مەهدی نەهێنایە سەرزمان. ئەلیەسع نێردراوی دووەمیشی کوشت. باوکی عەبدوللە

بەخێرایی ڕێگەی دەبڕی و ئەلیەسع ڕووبەرووی بوویەوە و ئەو ڕۆژەیان بەجەنگ بەسەر برد. لەشەودا، دوو سوپا لەیەك جیابوونەوە و ئەلیەسع لەگەڵ هاوەڵان و بنەماڵە وکوڕە مامەکانی هەڵات و باوکی عەبدوللە و هاوەڵانی بەخەمێکی گەورەوە شەویان کردە ڕۆژ و نەیاندەزانی چ بەڵایەك بەسەر مەهدی وکوڕەکەی دێنن. کاتێك ڕۆژ بوویەوە، خەڵکانی سیجلماسە هاتنە لای باوکی عەبدوللە و ئەویان لەهەڵاتنی ئەلیەسع ئاگادار کردەوە. باوکی عەبدوللە و سوپاکەی هاتنە ناو شارەکە و خۆیان گەیاندە زیندانەکەی مەهدی و لەگەڵ کوڕەکەی ئازادیان کردن. خەڵکان شادمانی خۆیان دەربڕی. باوکی عەبدوللە، مەهدی و کوڕەکەی سواری ئەسپ کرد و خۆی لەگەڵ سەرکردەی هۆزەکان پیادە ڕێگەیان دەبڕی. باوکی عەبدوللە لەناو خەڵکان دەنگی بەرز کردەوە: ئەمە سەروەری ئێوەیە و لەشادمانیدا، فرمێسکی لەچاو دەباراند تا گەیشتە ڤوستات. لەوێ خێوەتیان هەڵدا. فەرمانیدا بەدوای ئەلیەسعدا بگەڕێن. ئەویان دۆزییەوە و گرتیان و قامچی بارانیان کرد تا گیانی دەرچوو.

کاتێك مەهدی مەبەستەکەی خۆی ئاشکرا کرد، چل ڕۆژ لەسیجلسماسە مایەوە و دواتر بەرەو ئەفریقییە بەڕێکەوت و سامانەکانی لەئەنکجان هێنایەدەر وباری چوارپێکانی کرد و لەگەڵ خۆی بردی. لەدەیەی کۆتایی ڕەبیع الاخری ۲۹۷/دێسامبەری ۹۰۹ زایینی گەیشتە ڕەقادە. بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی مناڵەکانی ئەغلەب و مناڵەکانی میدرار کەئەلیەسع لەوان بوو و سەد وسی ساڵ بێ هیچ ڕکەبەرێك فەرمانڕەوایەتی سیجلماسەیان دەکرد، هەروەها فەرمانڕەوایەتی مناڵەکانی ڕۆستەم لەتاهرەت کەسەد و شەست ساڵ بەتەنیایی فەرمانڕەوای تاهرەتیان کرد، کۆتایی پێهات و مەهدی فەرمانڕەوایی ئەم سنوورانەی گرتەدەست. کاتێك لەشاری ڕەقادە نزیك بوویەوە، خەڵکانی ڕەقادە و قیروان پێشوازییان لێکرد. باوکی عەبدوللە و ڕێبەرانی کوتامە پیادە لەبەردەم ئەودا ڕێگەیان دەبڕی و کوڕەکەی لەپشت سەری ئەوانەوە دەهات. هەموان سڵاو و دوروودیان بۆ نارد و ئەو بەشێوەیەکی نەرم و نیان و چاکەکارانە وەڵامی دانەوە و فەرمانی پێدان بۆ ماڵ و حاڵی خۆیان بگەڕێنەوە. خۆی لەیەکێك لەکۆشکەکانی ڕەقادە دابەزی و فەرمانیدا ڕۆژی هەینی ناوی ئەو لەناو وتارەکاندا بخوێندرێتەوە.

ئەویان بەمەهدی سەروەری باوەرداران ناوبرد.

دوای وتاری رۆژی هەینی، پیاوێك بەناوی شەریف کەبانگەوازکەرەکانی لەگەڵدا بوو، خەڵکانی بەزۆر کۆکردەوەو و پێشنیاری ئایینەکەی خۆی پێدەکردن. هەرکەس رازی دەبوو، چاکەی لەگەڵ دەکرد و هەرکەس وەڵامی نای دەدایەوە، زیندانی دەکرا. جگە لەژمارەیەکی کەم کەس شوێن ئایینەکەی نەکەوت و ژمارەیەك لەو کەسانەی رازی نەبوون، کوژران.

باوکی عەبدوللە کەنیزەکانی زیادەاللەی خستە بەردەستی مەهدی و ئەو، ژمارەیەکی زۆری بۆ خۆی و کوڕەکەی هەڵبژارد و ئەوانەی مانەوە، لەناو ڕێبەرانی کوتامەدا دابەشی کرد. فەرمانڕەوایی ناوچەکانی ئەفریقییە بەرێبەرانی کوتامە بەخشی. دیوانەکانی بەرپا کرد و باجی کۆکردەوە و جێگە پێی خۆی بەهێز کرد. هەموو شارەکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون و کارگوزارەکانی خۆی بۆ هەموو سەرزەمینەکان ڕەوانە کرد. ئەو، حەسەن کوڕی ئەحمەد کوڕی باوکی خێنزیری وەك کارگوزاری سەقەلییە دیاریکرد و ئەو، لەدەی زیحەججەی ٢٩٧/ بیست و یەکی ئۆگۆستی ٩١٠ زایینی گەیشتە مازەر و براکەی وەك کارگوزاری جەرجەنت راسپارد و ئیسحاق کوڕی مەهلی کردە قازی سەقەلییە. ئەو یەکەم قازی بوو بەنوێنەرایەتی مەهدی عەلەوی لەو شارەدا دەستنیشان کرا.

کوڕی باوکی خێنزیر تا ساڵی ٢٩٨/ ٩١٠و ٩١١ زایینی لە و سنورە مایەوە. دواتر هێرشی کردە سەر دەمنش و تاڵانی کرد. ژمارەیەکی زۆری ئەسیر و شارەکەی سوتاند وگەڕایەوە و ماوەیەکی دیکە مایەوە. ئەو بەشێوەیەکی خراپ هەڵس وکەوتی لەگەڵ خەڵك دەکرد و لەبەر ئەمە خەڵکان دژی ئەو راپەڕین و گرتیان و زیندانیان کرد و مەهدییان لەکارەکانی ئەو ئاگادار کردەوە و داوای بەخشینیان کرد. مەهدی ئەوانی بەخشی و عەلی کوڕی عومەری بەلەوی وەك کارگوزاری ئەوان دیاریکرد. ئەو لەکۆتایی زیحەججەی ٢٩٩/ یانزەی سێپتامبەری ٩١١ زایینی گەیشتە ئەو دەڤەرە.

## کوژرانی باوکی عەبدوللەی شیعی و براکەی باوکی عەباس

لەساڵی ٢٩٨/٩١٠ زایینی باوکی عەبدوللەی شیعی کوژرا. مەهدی (عوبەیداللە) ئەوی کوشت.

هۆکاری کوشتنەکەی ئەوە بوو کاتێك هەموو شارەکان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی مەهدی بوون و خۆی کاروبارەکانی گرتەدەست و دەستی باوکی عەبدوللە و باوکی عەباسی برای کورت کردەوە، باوکی عەباس رژدی برد و پشت گوێخستنی ئەوانی بەکارێکی نەشیاو لەقەڵەمدا. ئەو لەشوێنی مانەوەی براکەی مەهدی بەریسوا لەقەڵەم دەدا و خراپەی ئەوی دەهێنایە سەرزمان. براکەی رێگەی ئەم کارەی لێدەگرت و لەم کردەوەی ئەو رازی نەبوو بەڵام نارەزامەندی براکەی تەنیا پێداگری باوکی عەباسی لێدەکەوتەوە تا ئەوەی رۆژێك وتەکانی دڵی هێنایە سەرزمان و بەباوکی عەبدوللەی برای وت: تۆ کاروبارەکانت گرتەدەست و تەسلیم بەکەسێکت کرد کەدەستی تۆی کورت کردەوە لەکاتێکدا دەبوا هیچ کات تۆ لەبیر نەکات. باوکی عەباس درێژەی بەوتەکانیدا تا ئەوەی کاریگەری لەسەر باوکی عەبدوللە بەجێهێشت. باوکی عەبدوللە رۆژێك بەمەهدی وت: ئەگەر لەناو کۆشکەکەی خۆت دانیشت و رێگەم بدەیت من فەرمانڕەوایەتی خەڵکانی کوتامە بکەم چوونکە زیاتر شارەزای چۆنیەتی ژیانی ئەوانم، پێگەی تۆ لەبەرچاوی خەڵکان زیاتر بەرز دەبێتەوە. مەهدی کە لەگفتوگۆی باوکی عەبدوللە و براکەی ئاگادار ببوویەوە، بەشێوەیەکی نەرم وەڵامی دایەوە. باوکی عەباس لەمبارەوە لەگەڵ گەورەکان قسەی کرد و ئەگەر کەسێکی بەشیاو دەزانی، نهێنییەکانی خۆی بۆ باس دەکرد و دەیوت: ئایا مەهدی پاداشتی ئێوە دەداتەوە، دواتر سامانەکانی بیر دەهێنانەوە کەمەهدی لەئەنکجانەوە هێنابووی. دەیوت: چۆن ئەم سامانەی لەناو ئێوەدا دابەش نەکرد.

هەموو ئەم هەواڵانە بێ ئەوەی باوکی عەباس بزانێت، بەمەهدی دەگەیشت و باوکی عەبدوللە هێشتا خۆی بەدوور دەگرت. باوکی عەباس دەیوت: ئەمە ئەو کەسە نییە باوەڕمان بەفەرمانبەری کردنی ئەو بوو، چوونکە مەهدی بەڵگەی

کۆتایی پێیە و نیشانە ئاشکراکانی خۆی دەردەخات. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر خەڵکان بەجێهێشت و یەکێك لەوان پیاوێ: بەکوتامە بوو بەناوی شێخ ئەلمەشایخ. ئەو سەردانی مەهدی کرد و پێی وت: ئەگەر تۆ مەهدیت، نیشانەیەکمان نیشان بدە چوونکە گومانمان لا دروست بووە. مەهدی ئەوی کوشت. باوکی عەبدوللە ترسا و زانی مەهدی دڵی لێ پیس کردووە. ئەو و براکەی و هاوەڵانیان لەگەڵ باوکی زاکی بڕیاریاندا مەهدی بکوژن و جگە لەدەستەیەکی کەم هەموو هۆزەکانی کوتامە پەیوەستیان بوون. لەناو ئەواندا پیاوێك دەبینرا کەوای نیشاندەدا لەگەڵ ئەوانە بەڵام مەهدی لەهەموو پێشهاتەکان ئاگادار دەکردەوە. ئەوان چەندین جار ڕۆشتنە لای مەهدی بەڵام دەرفەتی کوشتنی ئەویان دەستنەکەوت. ئەم دەستەیە شەوێك لای باوکی زاکی کۆبوونەوە و پیلانیان داڕشت. بۆ بەرەبەیانی، باوکی عەبدوللە بەجل و بەرگی پێچەوانەوە ڕۆشتە لای مەهدی. مەهدی هەستی بەجل و بەرگەکانی ئەو کرد بەڵام ئاگاداری نەکردەوە. باوکی عەبدوللە سێ ڕۆژ بەم جل و بەرگە دەڕۆشتە لای مەهدی. مەهدی پێی وت: چ شتێك تۆی پەرێشان کردووە کەجلەکانی خۆت پێچەوانە لەبەر دەکەیت؟ باوکی عەبدوللە وتی: تا ئێستا نەمزانیوە بەپێچەوانە جلەکانم لەبەر کردووە. مەهدی وتی: دوێ شەو و شەوەکانی پێشتر لەکوێ بوویت؟ باوکی عەبدوللە بێدەنگ بوو. مەهدی وتی: ئایا لەماڵی باوکی زاکی شەوت نەکردە ڕۆژ؟ باوکی عەبدوللە وتی: بەڵێ، دەترسام. مەهدی وتی: ئایا مرۆڤ جگە لەدوژمنەکەی خۆی لەکەسی دیکە دەترسێت؟ باوکی عەبدوللە زانی مەهدی لەنهێنییەکەی ئەوان ئاگادار بۆتەوە. لای مەهدی ڕۆشت و هاوەڵانی ئاگادار کردەوە و هەمووان ترسان و لەڕۆشتن بۆ بارەگای مەهدی خۆیان بەدوور دەگرت.

ئەم گفتوگۆیە کاتێك ئەنجامدرا کەپیاوێك بەناوی کوڕی قەدیم لای ئەو دانیشتبوو کەیەکێك لەهاوەڵە نزیکەکانی باوکی عەبدوللە هەژمار دەکرا و سامانە فراوانەکانی زیادەالله لای ئەو بوو. وتی: گەورەم، ئەگەر مۆڵەتم پێبدەیت، ئەوان دێنمە لای تۆ. ئەو ڕۆشت و هەموویانی هێنایە لای مەهدی. مەهدی هەموو ڕاستییەکانی بۆ دەرکەوت. بەشێوەیەکی نەرم هەڵس و کەوتی کرد و ئەوانی لەناو

شارەکاندا بڵاو کردەوە. باوکی زاکی کردە فەرمانڕەوای تەرابلوس. نامەیەکی بۆ کارگوزارەکەی خۆی لەتەرابلوس نووسی و فەرمانی پێدا کاتێك باوکی زاکی دەگاتە ئەوشارە، بیگرێت و بیکوژێت. کاتێك باوکی زاکی گەیشتە تەرابلوس، کارگوزار کوشتی و خوێنی ڕشت و سەری ئەوی بۆ بارەگای مەهدی ڕەوانە کرد. کوڕی قەدیم هەڵات بەڵام گرتیان و بەفەرمانی مەهدی خوێنیان ڕشت.

مەهدی بەعروبە، پاسەوانەکەی خۆی و کەسانی هاوڕێی فەرمانیدا باوکی عەبدوڵلە و باوکی عەباس بخەنە ژێر چاودێرییەوە و هەردووکیان بکوژن. کاتێك ئەم دوانە لەکۆشك نزیك کەوتنەوە، عروبە هێرشی کردە سەر باوکی عەبدوڵلە. باوکی عەبدوڵلە پێی وت: کوڕم، ئەو کارە مەکە.؟ وتی: ئەو کەسەی تۆ داوات دەکرد ملکەچی فەرمانەکانی بین، فەرمانی کوشتنی تۆی پێداوم. بەم شێوەیە باوکی عەبدوڵلە و براکەی کوژران. کوژرانی ئەم دوانە و باوکی زاکی لەیەك کاتدا بوو. دەڵێن: مەهدی نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند و وتی: هیوادارم خواوەند بتبەخشێت ئەی باوکی عەبدوڵلە و بۆ هەوڵەکانت، پاداشێکی چاکت بداتەوە.

دوای کوژرانی ئەم دوانە شۆڕش دەستی پێکرد و هاوەڵەکانیان دەستیان بۆ شمشێر برد. مەهدی خۆی سوار ئەسپ بوو و ئەمانی بەخەڵکان بەخشی و ئەوان هێور بوونەوە. دواتر مەهدی ئەوانی گرت و کوشتاری کردن. شۆڕشێکی دیکە لەنێوان کوتامە و قیروان ئەنجامدرا و ژمارەیەکی زۆر کوژران. مەهدی هاتەدەر و شۆڕشەکەی دامرکاندەوە و بانگەوازکەران لەبانگەشە کردن بۆ شیعەگەری دەستیان هەڵگرت.

کاتێك بارودۆخی مەهدی سەقامگیر بوو، باوکی قاسم، نێزاری کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. خەڵکانی کوتامە بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە و منداڵێکیان خستەسەر دەست و وتیان: ئەمە هەمان مەهدییە و دواتر گومانیان کرد پێغەمبەرێکە کەوەحی بۆ دێتە خوار. ئەوان گومانیان دەکرد باوکی عەبدوڵلە نەمردووە و دواتر هێرشیان کردە سەر میلە. مەهدی لەم هێرشە ئاگادار بوویەوە و باوکی قاسمی کوڕی، بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. ئەو، لەشارەکەدا گەمارۆی خستنەسەر و دژی باوکی قاسم جەنگان. بەڵام باوکی قاسم شکستی پێهێنان و

ژمارەیەکی زۆریان کوژران. منداڵەکەیش کوژرا. خەڵکانی سەقەلیە لەگەڵ کوڕی وەهب دژی ئەو شۆڕشیان کرد و ئەو چەندین کەشتی جەنگی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. سەربازەکانی مەهدی دەستیان بەسەر سەقەلییەدا گرت و کوڕی وەهبیان لەگەڵ خۆیان هێنا و مەهدی خوێنی ڕشت. خەڵکی تاهرەتیش ناسازگاری مەهدییان گرتەبەر. مەهدی جەنگی دژی ئەوان ڕاگەیاند و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و نەیارەکانی کوشت. دەستەیەك لەمناڵەکانی ئەغلەب کەدوای مەرگی زیادە الله بۆ رەقادە گەڕابوونەوە، لەسەر دەستی مەهدی کوژران.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا قاسم کوڕی سیما و دەستەیەك لەسەرکردەکان بۆ گرتنی حسەین کوڕی حەمدان بەرێکەوتن. ئەوان ڕۆشتنە قرقیسیا و رەحبە بەڵام ئەویان نەدۆزییەوە. موقتەدر نامەیەکی بۆ باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان فەرمانڕەوای موسڵ نارد و فەرمانی پێدا شوێنپێی حسەینی برای هەڵگرێت. ئەو لەگەڵ قاسم کوڕی سیما بەرێکەوتن و لە تکریت بەحسەین گەیشتنەوە. لەگەڵ ئەو جەنگان و حسەین شکستی خوارد. ئەو، براکەی ئیبراهیم کوڕی حەمدانی نارد و داوای ئەمانی کرد. ئەمانیان پێبەخشی و هاتە ناو بەغداد. خەڵات کرا و ئاڵای فەرمانڕەوایەتی قوم و کاشانی بۆ بەسترا. ئەو بەرەو سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی بەرێکەوت و عەباس کوڕی عەمرۆ لەوێ گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا بارس، کۆیلەی ئیسماعیلی سامانی، گەیشتە بەغداد و فەرمانڕەوایی دیاری رەبیعەی پێبڕا کەپێشتر باسمان کرد.

لەم ساڵەدا لەنێوان تاهیر محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی لەیس و سوبکەری (شوبکەری و سەکری) کۆیلەی عەمرۆ جەنگ ڕوویدا. سوبکەری، تاهیر و براکەی یەعقوب کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆی گرت و لەگەڵ دەبیرەکەی، عەبدولرەحمان کوڕی جەعفەری شیرازی ئەوانی ڕەوانە کرد. عەبدولرەحمان ئەو دووانەی هێنایە بەغداد و هەردووکیان زیندانی کران. سوبکەری بێ هیچ فەرمانێك لەخەلیفەوە، دەستی بەسەر فارسدا گرت و کاتێك دەبیرەکەی گەیشتە بەغداد،

خەلیفە فەرمانی خۆی بۆ وەرگرتنی سامانەکان لەسوبکەری پێدا. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٢٩٧/٩١٠ زایینی روویدا.

لەم ساڵەدا خەڵاتیان بەموزەفەری خزمەتکار بەخشی و فەرمانی پێدرا بۆ جەنگی رۆمییەکان بەرێکەوێت. ئەو لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوت و هاوڕێ لەگەڵ باوکی ئەعەزی سەلەمی لەکەنارەکانی مەڵتییەوە هێرشی برد و سەرکەوتن و تالآنی زۆری دەستکەوت و دەستەیەك لەرۆمییەکانی ئەسیر کرد و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا فەرمانڕەوایەتی ئەرمەنستان و ئازەربایەجان بەیوسف کوڕی باوکی ساج سپێردرا و بەڵێنیدا ساڵانە سەد و بیست هەزار دینارماڵیانی ئەم ناوچانە بدات. ئەو لەدینەوەرەوە بەرەو ئەم سەرزەمینە بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا لەبەغداد لەبەیانییەوە تا ئێواریێ تەرزەی گەورە باری. ئەندازەی ئەم بارینە گەیشتە چوار پەنجە و سەرما بەرادەیەك زیادی کرد کەئاو و سرکە و هێلکە و رۆن بەستی و دارخورماکان و ژمارەیەکی زۆر لەدارەکان وشك بوون.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی ریێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی تاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی تاهیر مرد.

لەم ساڵەدا سوسەنی پەردەدار (دەرگاوان و پاسەوان)ی موقتەدر کوژرا چوونکە هاوکاری هاتنە سەرکاری کوڕی موعتەزی دەکرد بەڵام کاتێك کوڕی موعتەز هاتە سەرکار، کەسێکی دیکەی وەك پەردەداری خۆی دیاریکرد و سوسەن ڕۆشتە لای موقتەدر. کاتێك کوڕی فورات وەزارەتی گرتەدەست، تەنیا گرنگی بەبۆچوونەکانی خۆی دەدا و بەم شێوەیە سوسەن رێگەی ناسازگاری ئەوی گرتەبەر و بۆ بەفیرۆدانی بارودۆخی ئەو هەوڵی دەدا. کوڕی فورات، موقتەدری لەکار و کردەوەکانی سوسەن ئاگادار کردەوە و پێی وت ئەو هاوکاری کوڕی موعتەزی کردووە. موقتەدر ئەوی گرت و کوشتی.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی داود کوڕی جەراح مامی عەلی کوڕی عیسای وەزیر، مرد.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی جەعفەر کوڕی خاقان و باوکی عەبدولرەحمانی دێهکانی هەردووکیان مردن.

# پێڕست

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و حەوتی کۆچی ( ٩١٠ زایینی )

### زاڵبوونی لەیس لەفارس و کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا لەیس کوڕی عەلی کوڕی لەیس لەسیستانەوە هێرشی کردە سەر فارس و دەستی بەسەردا گرت و سوبکەری لەو شارە بۆ ئەرجان هەڵات. کاتێك موقتەدر لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، هێز و توێشووی خستە بەردەستی مونسی خادم (خزمەتکار) و ڕەوانەی فارسی کرد تا هاوکاری سوبکەری بکات. ئەم دووانە لەئەرجان کۆبوونەوە.

لەیس لەکۆبوونەوەی ئەوان ئاگادار بوویەوە و هێرشی کردە سەریان. لەیس هەواڵی پێگەیشت کەحسەین کوڕی حەمدان بۆ هاوکاری مونس لەقومەوە بەرەو بەیزا دێت. ئەو براکەی خۆی لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاکەی بەرەو شیراز نارد تا شارەکە بپارێزێت. لەیس خۆی لەگەڵ سوپاکەی ڕێگەیەکی نزیکی بڕی تا ڕووبەڕووی حسەین کوڕی حەمدان ببێتەوە. ڕێنیشاندەر ئەوانی بەرەو ڕێگەیەکی دژوار و پیادەڕەو برد و لەیس بەشی هەرە زۆری چوارپێکانی لەڕێگە لەدەستدا و لەگەڵ سوپاکەی ڕووبەڕووی دژواری فراوان بوونەوە. ئەو ڕێنیشاندەرەکەی کوشت و لەم ڕێگە گەڕایەوە و لەشوێنێك جێگیر بوو کەدەیڕوانییە سەر سوپاکەی مونس بەڵام گومانی دەکرد ئەمە ئەو سوپایە لەگەڵ براکەی بۆ شیرازی ڕەوانە کردووە. دەنگی تەکبیریان بەرز کردەوە و مونس و سوبکەری لەگەڵ دوو سوپاکەی خۆی هێرشیان کردەسەر و ئاگری جەنگێکی قورس بڵێسەی سەند. سوپاکەی لەیس شکستی خوارد و خۆی ئەسیر کرا.

کاتێك مونس، لەیسی گرت، هاوەڵانی پێیان وت: باشترە سوبکەریش دیل بکەیت و دەست بەسەر فارسدا بگرین و نامەیەك بۆ خەلیفە بنووسین تا فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینە بەتۆ بسپێرێت. مونس وتی: بەیانی کاتێك سوبکەری وەك ڕۆژەکانی دیکە هاتە لامان، ئەو کارە دەکەین. کاتێك شەو داهات، مونس بەشێوەیەکی نهێنی پەیکی بۆ لای سوبکەری نارد و لەپێشنیاری هاوەڵانی

ئاگاداری کردەوە و فەرمانی پێدا هەمان شەو بەرەو شیراز بەرێکەوێت. سوبکەری ئەو کارەی کرد. بۆ بەیانی، مونس بەهاوەڵانی وت: پێم وابێت سوبکەری درەنگی کردووە، بڕۆن و لێکۆڵینەوە بکەن. ئەویان ئاگادار کردەوە کەسوبکەری شەوانە بەرەو شیراز ڕۆشتووە. مونس هاوەڵانی خۆی سەرکۆنە کرد و وتی: ئێوە ئەوتان ئاگادار کردۆتەوە و هەڵاتووە. مونس لەگەڵ لەیس بۆ بەغداد گەڕایەوە و حسەین کوڕی حەمدان ڕێگەی شاری قومی گرتەبەر.

## وەرگرتنەوەی فارس لەسوبکەری

کاتێك مونس لەفارس گەڕایەوە، دەبیرەکەی، عەبدولرەحمان کوڕی جەعفەر کاروبارەکانی گرتەدەست و هاوەڵانی سوبکەری ڕژدییان پێبرد و تۆمەتیان بۆ هەڵبەست کە لەگەڵ سەرکردەکان یەکیان گرتووە و نامە بۆ خەلیفە دەنووسێت. سوبکەری ئەوی گرت و زیندانی کرد و ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمی بەمی لەجێگەی ئەو دانیشاند. ئیسماعیل ئەوی بۆ یاخی بوون و خۆ دوورخستنەوە لەڕەوانە کردنی باج وماڵیات بۆ خەلیفە هاندا. سوبکەری ئەو کارەی کرد.

عەبدولرەحمان کوڕی جەعفەر نامەیەکی بۆ کوڕی فورات، وەزیری خەلیفە نووسی و ئەوی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. بۆی نووسی کەچۆن ڕێگەی یاخیبوونی لەسوبکەری گرتووە بەڵام سوبکەری ئەوی زیندانی کردووە. کوڕی فورات نامەیەکی بۆ مونس، کە لەواست بوو، نووسی و فەرمانی پێدا بۆ فارس بگەڕێتەوە. کوڕی فورات لەوەی مونس، سوبکەری لەفارس نەگرتبوو، بەناتەوانی لەقەڵەمدا و فەرمانی پێدا لەگەڵ لەیس، سوبکەریش بێنێتە بەغداد.

سوبکەری نێردراوێکی بۆ لای مونس ڕەوانە کرد و چەندین دیاری گرانبایی بۆ نارد. داوای لێکرد لەنێوان ئەو و خەلیفە نێوەنجیگەری بکات. مونس نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و بەنوێنەرایەتی سوبکەری چەندین بەڵێنیدا و بەم شێوەیە جەنگ لەنێوان ئەوان ڕووینەدا. کوڕی فورات زانی مونس، سوبکەری خۆش دەوێت، لەبەر ئەمە وەسیفی دەبیری لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان و محەممەد کوڕی جەعفەری فاریابی ڕەوانە کرد و گرتنی فارسی بەمحەممەد سپارد. ئەویش

نامەیەکی بۆ مونس نووسی تا لەگەڵ لەیس بڕواتە بەغداد. مونس ڕۆشتە بەغداد.

محەممەد کوڕی جەعفەر گەیشتە فارس و لەکەنار دەروازەی شیراز ڕووبەڕووی سوبکەری بوویەوە. سوبکەری بۆ بەم هەڵات. محەممەد جەعفەر شوێنی کەوت و ناکاوگیری کرد. سوبکەری لەبەم ڕۆشت و بۆ دووەم جار ڕووبەڕووی محەممەد بوویەوە. محەممەد دووبارە شکستی پێهێنا و سامانەکەی تالأن کرد – دواتر ئاماژە بەچۆنیەتییەکەی دەدەین– محەممەد کوڕی جەعفەر دەستی بەسەر فارسدا گرت و قەنبەج، خزمەتکاری ئەفشینی، وەك کارگوزاری ئەو ناوچە دانا.

ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم ڕووداوە لەساڵی ٢٩٨/٩١١ زایینی ڕوویدا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موقتەدر، قاسم کوڕی سیمای بۆ ئەنجامدانی جەنگی هاوینە ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عیسا نەوشەری (فەرمانڕەوای میسر) لەمانگی شەعبان/ ئاوریل لەمیسر مرد. ئەو دە ڕۆژ دوای مەرگی عەباس کوڕی بێستام کۆچی دوایی کرد و لەبەیت ئەلموقەدەس بەخاك سپێردرا. موقتەدر، تەکینی خزمەتکاری لەجێگەی ئەو دانا و لەنیوەی ڕەمەزان/ بیست و نۆی مەی، خەڵاتی پێبەخشی.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی سالم، هاوڕێی سەهل کوڕی عەبدوللەی توستەری، مرد.

لەم ساڵەدا فەیز کوڕی خزر یا بەگومانێك کوڕی محەممەد باوکی فەیزی ئەولاشی تەرسوسی و ئەبوبەکر محەممەد کوڕی داود کوڕی عەلی ئیسفەهانی، فەقیهی زاهری و موسا کوڕی ئیسحاقی قازی و قازی باوکی محەممەد یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی حیمدا لەهەشتا و نۆ ساڵی، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و هەشتی کۆچی ( ٩١١ زایینی )

## زاڵبوونی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل لەسیستان

لەرەجەب/ مارسی ئەم ساڵە، باوکی نەسر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی دەستی بەسەر سیستاندا گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێك بارودۆخی باوکی نەسر سەقامگیر و فەرمانڕەوایەتییەکەی بەهێز بوو، لەساڵی ٩٠٩/٢٩٧ زایینی لەبوخارا کە لەوێ مابوویەوە، هێرشی کردە سەر ڕێ و لەوێوە هێرشی کردە سەر هەرات و لەموحەرەمی ٢٩٨/ سێپتامبەری ٩١٠ بۆ هێرش کردنە سەر سیستان سوپای کۆکردەوە و دەستەیەك لەسوپاسالارەکان و گەورەکانی خۆی ڕەوانە کرد کەئەحمەد کوڕی سەهل و محەممەد کوڕی موزەفەر و سەمیجوری دەواتی، گەورەی بنەماڵەی سەمیجور، فەرمانڕەوایانی سامانی خوراسان، (دواتر باسیان دەکەین) لەناویاندا دەبینران. باوکی نەسر، حسەین کوڕی عەلی مەرەورووزی وەك فەرماندەی ئەم سوپایە دیاریکرد. ئەم سوپایە گەیشتە سیستان. لەو کاتەدا موعەدەل کوڕی لەیسی سەفار فەرمانڕەوای سیستان بوو.

کاتێك هەواڵی ئەم سوپایە بەموعەدەل گەیشت، براکەی باوکی عەلی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی لەیسی بۆ بۆست و ڕوخەج نارد تاسامانەکانی ئەو ناوچە بپارێزێت و لەوێوە خواردەمەنی بۆ سیستان بنێرێت. ئەحمەد کوڕی هێرشی کردە سەر عەلی لەبۆست و ئەوی ئەسیر کرد و بۆ هەراتی برد. کاتێك موعەدەل لەئەسیرکرانی براکەی ئاگادار بوویەوە، ڕێگەی سازان لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی گرتەبەر و لای ئەو پەنای گرت و حسەین، سیستانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. حسەین، ئەحمەد کوڕی باوکی ساڵح مەنسور کوڕی ئیسحاقی (کوڕە مامی خۆی) وەك فەرمانڕەوای سیستان دیاریکرد و هاوڕێ لەگەڵ موعەدەل بۆ بوخارا گەڕایەوە. دواتر خەڵکانی سیستان لەساڵی ٩١٣/٣٠٠ زایینی (ئاماژەی پێدەدەین) شۆڕشیان کرد.

کاتێك سامانییەکان دەسەڵاتیان بەسەر سیستاندا گرت، ئاگادار بوونەوە کەسوبکەری لەبیابانەکانی فارسەوە بەرەو سیستان بەرێکەوتووە. سوپایەکیان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە کاتێك رووبەرووی سوبکەری و هاوەڵانی بوویەوە کەشەکەت و ماندوو ببوون. سوبکەریان ئەسیر و بەسەر سوپاکەیدا سەرکەوتن. ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل، هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بۆ موقتەدر نووسی و موقتەدر لەنامەیەکدا سوپاس و دەسخۆشی لێکرد و فەرمانی پێدا سوبکەری و محەممەد کوڕی عەلی کوڕی لەیس بۆ بەغداد ڕەوانە بکات. ئەو، ئەو دووانەی بۆ بەغداد ڕەوانە کرد و ئەوان سوار لەسەر فیل هێنرانە ناو بەغداد. موقتەدر، نێردراوەکانی ئەحمەد(سامانی) فەرمانڕەوای خوراسانی لەگەڵ دیارییە گرانباییەکان گەڕاندەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل مامی ئیسحاق کوڕی ئەحمەدی لەزیندان ئازاد کرد و ئەوی بۆ سەمەرقەند و فەرغانە گەڕاندەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی جەعفەری فەریابی و قەنبەجی خزمەتکار، فەرمانڕەوای فارس مردن و عەبدوللە کوڕی ئیبراهیمی مەسمەعی جێگەی ئەوی گرتەوە و کرمانی پەیوەستی فارس کرد.

لەم ساڵەدا دایکی موسای هاشمی وەك پێشکاری کۆشکی موقتەدر باللە دیاریکرا. ئەو نامەکانی موقتەدر و دایکی ئەوی بەوەزیر دەگەیاند. ناوی ئەومان برد چوونکە لەداهاتووی ئەم فەرمانڕەوایەتییە کاریگەری بەجێهێشت و دەبێت ئاماژەی پێبدرێت وەگەرنە چاوپۆشین لەناوی ئەو شیاوتر دەهاتە بەرچاو.

هەروەها لەم ساڵەدا قاسم کوڕی سیما جەنگی هاوینەی ئەنجامدا.

لەرەجەب/ مارسی ئەم ساڵە موزەفەر کوڕی جاخ، فەرمانڕەوای یەمەن مرد و جەنازەی ئەویان بردە مەککە و بەخاکیان سپارد. خەلیفە دوای ئەو مولاحزی هێنایە سەرکار.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی ڕێ و ڕەسمی حەجی لەگەڵ

خەڵکان ئەنجامدا.

لەشەعبان/ ئاوریلی ئەم ساڵە لەبەغداد دەستەیەك دەستگیر كران. دەوترا ئەوان شوێنكەوتەی پیاوێك بوون كەخۆی بەخوا ناو دەبرد. ناوی محەممەد كوڕی بیشر بوو.

لەم ساڵەدا لەحەدیسەی موسڵ زەردبایەكی گەرم هەڵیكرد و بەهۆیەوە ژمارەیەكی زۆر گیانیان لەدەستدا.

لەم ساڵەدا باوكی قاسم جونەید كوڕی محەممەدی سۆفی كەپێشەوای جیهانی سۆفیگەری ڕۆژگاری خۆی بوو، مرد. ئەو زانستی فقە لەباوكی سور، هاوڕێی شافعی و سۆفیگەری لە سەری سیَقتی فێر ببوو.

لەم ساڵەدا باوكی بەزرەی ژمێریار مرد. ناوی ئەو فەزڵ كوڕی محەممەدە.

لەم ساڵەدا قاسم كوڕی عەباس باوكی محەممەدی مەعشەری مرد. ئەویان بەمەعشەری ناو بردووە چوونكە كوڕی كچی باوكی مەعشەر نەجیحی مەدەنی بوو كەكەسێكی خۆپارێز و خواپەرەست لەقەڵەم دەدرا.

لەم ساڵەدا ئەحمەد كوڕی سەعید كوڕی مەسعود كوڕی عیسام باوكی عەباس و محەممەد كوڕی ئەیاس، باوكی، باوكی زەكەریا و نووسەری كتێبی مێژووی موسڵ، كۆچی دوایی كرد. ئەو چاكەكار، فرەزان و لەخەڵكانی ئەزد بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی دووسەد و نەوەد و نۆی کۆچی ( ٩١٢ زایینی )

### گیرانی کوڕی فورات و وەزارەتی خاقانی

لەزیحەججە/ جولای ئەم ساڵە، موقتەدر، وەزیرەکەی خۆی، کوڕی فوراتی قۆڵبەست کرد. ماوەیەك دوای گرتنی ئەو سێ ئەستێرەی کلکدار لەئاسمان دەرکەوتن. یەکێك لەم ئەستێرانە لەکۆتاییەکانی ڕەمەزان/ بیست و یەکی مەی و ئەوی دیکەیان لەزیقەعدە/ جون لەبەشی ڕۆژهەڵات و سێیەمیان لەزیقەعدە/ جون لەبەشی ڕۆژئاوا و لەسەر بورجی دووپشك دەرکەوت.

کاتێك وەزیریان گرت، پاسەوانیان بۆ ماڵەکەی دانا و پەردەی بنەماڵەکەیان دڕاند و سامانی خۆی و کەسەکانیان تاڵان کرد. لەبەغداد شۆڕش دەستیپێکرد کەبۆ وەزیر قۆڵبەست کراوە. خەڵکانی بەغداد سێ ڕۆژی پڕ ڕەنج و دژوارییان بەسەر برد و دواتر هێور بوونەوە.

ماوەی وەزارەتی کوڕی فورات کەیەکەم جار بوو، سێ ساڵ و هەشت مانگ و سیانزە ڕۆژ درێژەی کێشا. دوای ئەو باوکی عەلی محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی عوبەیداللە کوڕی یەحیا کوڕی خاقان وەك وەزیر دەستنیشان کرا و دیوانەکانی ڕێکخست و لێکۆڵینەوەی لەکوڕی فورات کرد. باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی یەحیا کوڕی باوکی بوغل لێپێچینەوەی لەکوڕی فورات دەکرد. براکەی ئەو باوکی حەسەن کوڕی باوکی بوغل، فەرمانڕەوای ئیسفەهان بوو. باوکی حەسەن و دایکی موسای پێشکار، چەندین تۆمەتیان بۆ کوڕی فورات هەڵبەست تا ئەوەی موقتەدر ئەوی لەئیسفەهانەوە بانگ کرد تا وەزارەت بەو بسپێرێت. کاتێك خاقانی لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، شیرازەی کارەکانی تێکچوو و بەناچاری هاتە بارەگای خەلیفە و ئەوی لەچەند و چۆنی کارەکە ئاگادار کردەوە. موقتەدر فەرمانی پێدا هەردوو براکە بگرێت. ئەو، باوکی حەسەنی گرت و نامەیەکی نووسی تا باوکی حسەین قۆڵبەست بکەن. باوکی حسەینیان گرت بەڵام لەدایکی موسای پێشکار ترسا و هەردووکیانی ڕزگار کرد و پێگەیەکی بەرزی پێبەخشین.

دواتر بارودۆخی خاقانی بەتەواوی شلەژا چوونکە پیاوێکی ناتەوان و دڵناسك و کەم تاقەت بوو. نامەی کارگوزارەکانی پشتگوێ دەخست و گرنگی بەچۆنیەتی کۆکردنەوەی باج نەدەدا. تەنیا دەویست رەزامەندی و شادمانی هەموان بەدەست بێنێت. ئەو مۆڵەتی نەدەدا کەس لەبەندەکانی حکومەت لای ئەو خۆی بەبەندە بناسێنێت و هەرکات دەستەیەك لەسۆباییکەران[1] و مسێکنەکانی سەرقاڵی نوێژ کردن دەبینی، خۆی دەخستە ناو ریزی ئەوان و نوێژی دەخوێند. هەرکات کەسێك داوای شتێکی دەکرد، دەستی دەخستە سەر سینەی و دەیوت: بەسەرچاو، بەچاوان و لەبەر ئەمە ئەویان بە دق صدره (سینەکوت، ئەوەی لەسینەی خۆی دەدات) ناوبرد. بەڵام لەپێدانی پارە بۆ سوار و سەرکردەکان کەمتەرخەمی دەکرد و بەمشێوەیە ئەوان لێی دوورکەوتنەوە و وەزارەتەکەی بەرەو لاوازی رۆشت.

مناڵەکانی زۆریان لێدەگرت و هەرکام بۆ وەرگرتنی بەرتیل هەوڵیان دەدا. ئەو هەرچەند رۆژ جارێك فەرمانرەوایەکی ئاڵ و گۆڕ دەکرد بەشێوەیەك کەتەنیا لەماوەی بیست رۆژ حەوت کارگوزاری لەکوفە گۆڕی. ئەم حەوت کەسە لەسەر رێگەکەی ئەو کۆبوونەوە، یەکێك لەوان گەڕایەوە و ئەوانی دیکە داوای ئەو برە پارەیان کرد کەوەك بەرتیل بەکوڕەکانی ئەویان دابوو. ئەم هۆنراوەیان بۆ ئەو هۆنیوەتەوە:

| | |
|---|---|
| وزير قد تكامل فى الرقاعه | يولى ثم يعزل بعد ساعه |
| اذا اهل الرشى اجتمعو الديه | فخير القوم اوفرهم بضاعه |
| و ليس يلام فى هذا بحال | لان الشيخ افلت من مجاعه |

واتاکەی: وەزیرێك کە لەگولیدا گەیشتۆتە ترۆپك، یەکێك دەستنیشان دەکات و دوای کاژێرێك لەسەر کار لایدەبات، هەرکات بەرتیل دەران لای ئەو کۆدەبنەوە، باشترینی ئەوان، بەتواناتری ئەوانە. بەهیچ جۆرێك ناتوانین سەرکۆنەی بکەین چوونکە شێخ لەبرسیەتی هەلاتووە.

بارودۆخ زیاتر لەجاران شێوا تا ئەو جێگەی هاورێکانیشی زۆریان لێدەکرد و پارەکانیان دەدزی و خراپەکارییان کردە پیشە. شیرازەی کارەکان تێکچوو و

[1] مەلەوانەکان

ئەندێشەكان بەفیڕۆ دران و خەلیفە، بەردەوام وەزیرەكانی خۆی لادەبرد یا ئەوانی دەخستە زیندانەوە. خەلیفە لەسەر بنەمای قسەی ژنان و كۆیلەكان، ئەم و ئەوی دەگرت و فەرمان و پێشنیارەكانی ئەوانی ئەنجامدەدا. سەرزەمینەكان یەك لەدوای یەك لەژێر دەسەلاتی ئەودا نەدەمان و كارگوزارەكان چاوی تەماحیان دەبڕییە سنوورەكانی خۆیان و ئەو بارودۆخە هاتە ئاراوە كەئاماژەی پێدەدرێت.

خەلیفە بەناچاری وەزیرەكەی، كوڕی فوراتی لەزیندان هێنایەدەر و وەك كەسێكی رێزدار، لەماڵێكدا نیشتەجێی كرد و سەبارەت بەكاری كارگوزارەكان و پێشهاتە تاڵەكان راوێژی پێدەكرد. ئەو، كوڕی فوراتی بەگەورە دەزانی و رێزی دەگرت و ئەمە دوای ئەوە بوو هەموو سامان و داراییەكانی ئەوی زەوت كرد.

## بیركردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا رۆستەم فەرماندەی سنورداران، لەگەڵ دەمیانە لەتەرسوس جەنگی هاوینەیان دەستپێكرد و گەمارۆی خستە سەر قەڵای مەلیح. دواتر پۆشتە ناو قەڵاكە و سوتاندی.

لەم ساڵەدا عەزیم و ئەغبەر دووان لەسەركردەكان زەكرویەی قەرەمتی بەوەرگرتنی ئەمان هاتنە بەغداد.

لەم ساڵەدا فەزڵ كوڕی عەبدولمەلیك رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵكان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەقەرەمتییەكان لەهاوەڵانی باوكی سەعیدی جونابی، گەیشتنە دەروازەی بەسرە. فەرمانڕەوای بەسرە محەممەد كوڕی ئیسحاق كوڕی كونداجیق بوو. ئەوان لەرۆژی هەینی گەیشتن و خەڵكان سەرقاڵی خوێندنی نوێژ بوون كەئاژاوەی شۆڕشی قەرەمتییەكان بەرز بوویەوە. پاسەوانەكانی دەروازەی بەسرە رووبەروویان بوونەوە. ئەوان دوو پیاویان بینی و بەرەو لای ئەوان ئەسپیان غاردا و قەرەمتییەكان یەكێك لەپاسەوانەكانیان كوشت و گەڕانەوە. محەممەد كوڕی ئیسحاق لەگەڵ دەستەیەك شوێنیان كەوت بەڵام ئەوانیان نەدۆزییەوە. دواتر دەستەیەكی دیكە شوێنیان كەوتن و خۆیان بەوان گەیاند. ژمارەیان سی كەس

بوو. ڕووبەڕوویان بوونەوە و ژمارەیەك كوژران. كوڕی كونداجیق لەبەر ئەوەی ئەم دەستەی بەپێشەنگی قەرەمتییەكان دەزانی، دەروازەكانی بەسرەی داخست و نامەیەكی بۆ وەزیر لەبەغداد نووسی و ئەوی لەهاتنی قەرەمتییەكان ئاگادار كردەوە و داوای هاوكاری كرد. كاتێك بەیانی داهات و هیچ نیشانەیەكی لەقەرەمتییەكان نەبینی، پەشیمان بوویەوە. سوپایەك لەگەڵ چەند سەركردەیەك لەبەغدادەوە هاتن.

لەم ساڵەدا خەڵكانی تەرابلوسی ڕۆژئاوا، دژی مەهدی، عوبەیدالله‌ی عەلەوی شۆڕشیان كرد. ئەو سوپایەكی بۆ جەنگی ئەوان نارد. سەربازەكان گەمارۆیان خستە سەر تەرابلوس بەڵام نەیانتوانی شارەكە بگرن. مەهدی لەجومادی الاخرەی ٣٠٠/ ژانویەی ٩١٣ زایینی، باوكی قاسمی (كوڕی خۆی) بۆ ئەو دیارە ڕەوانە كرد. ئەو، گەمارۆی خستە سەر تەرابلوس و خۆڕاگری كرد و جەنگێكی قورسی خستەگەڕ تا ئەوەی خواردەمەنی شارەكە كۆتایی پێهات و دانیشتوانی تەرابلوس ناچار بەخواردنی مردووەكان بوون. باوكی قاسم بەزۆر دەستی بەسەر شارەكەدا گرت و ئەمانی بەهەموان بەخشی. لەو كەسانەی شۆڕشیان دەستپێكردبوو، سامانێكی زۆری سەند و چەندین كەس لەدانیشتوانی شارەكەی وەك بارمتە لای خۆی هێشتەوە و كارگوزارێكی بۆ دیاری كردن و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا چەندین ئەردهەژێنی مەترسیدار لەقیروان ڕوویدا كەلەگەورەیی و مەترسیداریدا هاوشێوەی نەبینراوە و نەبیستراوە.

لەم ساڵەدا خەڵكی قیروان شۆڕشیان كرد و هەزار كەس لەخەڵكانی كوتامەیان كوشت.

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی ئەحمەد كوڕی كەیسان باوكی حەسەنی نەحوی مرد. ئەو لەنەحوی بەسرە و كوفە شارەزا بوو چوونكە ئەم زانستە لە سەعلەب و موبەرید فێر ببوو.

لەم ساڵەدا محەممەد كوڕی سەری قەنتەری و باوكی ساڵحی حافز و باوكی عەلی كوڕی سیبویە و باوكی ئیسحاق كوڕی حونەینی پزیشك، مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەدی کۆچی (٩١٣ زایینی)

## لابردنی خاقانی لەوەزارەت و وەزارەتی عەلی کوڕی عیسا

لەم ساڵەدا ناتەوانی خاقانی بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری وەزارەت بۆ موقتەدر ئاشکرا بوو. مەبەستی لابردنی ئەو و گەڕاندنەوەی باوکی حەسەن کوڕی فوراتی بۆ وەزارەت کرد بەڵام مونسی خزمەتکار ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت چوونکە بەپێی وتەکانی مونس، کوڕی فورات چەند ڕقێکی لەدڵدابوو: یەکەم ڕەوانە کردنی سوپا بۆ فارس بەفەرماندەیی کەسێك جگە لەو و گەڕاندنەوەی ئەو بۆ بەغداد – پێشتر ئاماژەمان پێدا–. مونس بەموقتەدری وت: ئەگەر تۆ کوڕی فورات بۆ وەزارەت بگەڕێنیتەوە، خەڵکان گومان دەکەن تۆ تەماحت لەسامانی کوڕی فورات کردووە و لەبەر ئەمە ئەوت لابردووە. باشتر وایە عەلی کوڕی عیسا لەمەککەوە بانگ بکەیت و کاروباری وەزارەت بەو بسپێریت. ئەو پیاوێکی بڕواپێکراو و چاکەکار و دیندارە.

موقتەدر فەرمانیدا ئەو بێننە بارەگاکەی و کەسی نارد و ئەوی لەمەککەوە هێنا. ئەو لەسەرەتای ساڵی ٣٠١/٩١٤ زایینی گەیشتە بەغداد و لەسەر تەختی وەزارەت دانیشت. ئەو، خاقانی گرت و زیندانی کرد بەڵام بەشێوەیەکی چاك هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکرد و بێ ڕێزی نەدەنواند. بەهەرحاڵ عەلی کوڕی عیسا هاتەسەرکار و بەراپەڕاندنی کارەکان سەرقاڵ بوو، هەموو شتێکی لای خۆی دەنووسی و دادخوازی دەکرد و ژمارەیەکی زۆر لەماڵیاتەکانی مەککە و فارسی پشتگوێ خست و دەرگای ڕووسپی خانەکانی[٢] دوبەقی بەست. ئەو بڕە پارەی خاقانی بۆ مانگانەی سوپاییەکان زیادی کردبوو، کەمی کردەوە چوونکە داهات و خەرجییەکانی هەڵسەنگاند و خەرجییەکانی بەزیاتر بینی و لەبەر ئەمە، ئەو بڕەی کەم کردەوە. فەرمانیدا مزگەوت و مزگەوتی هەینی دروست و نۆژەن بکەنەوە. ڕەنگەکەی سپی و حەسیرەکانی تیا ڕاخەن و چراکانی داگیرسێنن و بۆ پێشنوێژ و قورئان خوێن و بانگبێژەکان ڕۆژانەی دیاریکرد و فەرمانیدا نەخۆشخانەکان

---

[٢]– ڕووسپی (لەش فرۆش) ڕووسپی خانە (شوێنی لەش فرۆشەکان)؟!

ئامادە و دەرمانی پێویست بۆ چارەسەری نەخۆشەکان فەراهەم و پزیشکەکە شارەزاکانی بەخزمەت گرت. هەروەها لەماڵیاتی زەوییەکانی کەم کردەوە. کاتێك خاقانی لەسەر کار لابرا، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان بەدەستخەتی ئەو کاغەزیان دەنووسی و خوازیاری ئاسانکاری لەماڵیاتەکان یا وەرگرتنی مانگانە بوون. عەلی کوڕی عیسا سەیری دەستخەتەکانی کرد بەڵام پێیان رازی نەبوو. ویستی گرنگییان پێنەدات بەڵام لەسەرکۆنە کردنی خەڵکان ترسا. بەباشی زانی دەستخەتەکان بۆ خاقانی بنێرێت تا نوسراوە راستییەکان لەدرۆیینەکان جیابکاتەوە و ئەگەر سەرکۆنە کردن لەئارادابێت، خاقانی سەرکۆنە بکرێت. کاتێك دەستخەتەکانیان بردە لای خاقانی، وتی: ئەمە هەموو نوسراوی خۆم و خۆم ئەم فەرمانانەم داوە (فەرمانی منە کەنوسیومە). کاتیٚ: پەیك وەڵامی خاقانی بۆ عەلی کوڕی عیسا برد، عەلی کوڕی عیسا وتی: سوێند بەخوا درۆدەکات و دەزانێت کامە راستە و کامە درۆ (کامە هی خۆیەتی و کامە هی خۆی نییە) بەڵام هەموویان بەراست لەقەڵەم دەدات بۆ ئەوەی خەڵکانی وەسفی ئەو و سەرکۆنەی من بکەن. فەرمانیدا داواکارییەکان بێننەدی.

خاقانی بەکوڕەکەی وت: کوڕی خۆم! بەشێك لەو کاغەزانە دەستخەتی من نییە و ئەو کەخۆی دەزانێت کامە خەتی من و کامە درۆینەیە، ئەوانی بۆ لای من ناردووە تا ئەم چقڵە، لەدەستی ئێمە بچەقێت و خەڵکان ئێمە بەدوژمن بزانن بەڵام مەبەستەکەی نەهاتەدی.

## شۆڕش لەسیستان و فەرمانبەری دووبارە لەئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی

لەم ساڵەدا فەرمانڕەوا باوکی نەسر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی، سوپایەکی بۆ سیستان ڕەوانە کرد تا جارێکی دیکە دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرێت چوونکە خەڵکی ئەم شارە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردبوویەوە و ناسازگاری کارگوزارەکەیان دەکرد.

چۆنیەتی ئەم رووداوە بەم شێوە بوو: محەممەد کوڕی هورموز ناسراو بەمەولای سەندەلی لەخەواریج بوو، هەرچەند بەیەکێك لەخەڵکانی سیستان دادەنرا بەلاّم لەبوخارا دەژیا. ئەو پیرەپیاوێکی رێزدار بوو کەرێزیان دەگرت. رۆژێك ئەو هاتە لای حسەین کوڕی عەلی کوڕی عارس و داوای مانگانەی خۆی کرد. حسەین وتی: پیرەپیاوێکی وەك تۆ شیاوە لەسوچی پەرەستگایەك دانیشێت و سەرقاڵی خواپەرەستی بێت تا ئەو کاتەی فریشتەی مەرگ یەخەی دەگرێت (یانی تۆ شیاوی سوپا و جەنگ نیت و دەبێت خانەنشین بکرێیت). ئەم وتەیە محەممەدی تورە کرد. لەبەر ئەمە رێگەی سیستانی گرتەبەر. فەرمانڕەوای سیستان لەو کاتەدا مەنسور کوڕی ئیسحاق بوو. ئەو دەستەیەك لەخەواریجی کۆکردەوە و پێشنیاری شوێنکەوتنی سەفاری پێکردن و بەشێوەیەکی نهێنی بەیعەتی لەگەڵ عەمرۆ کوڕی یەعقوب کوڕی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی لەیس بەست. رێبەری خەواریج لەم کاتەدا محەممەد کوڕی عەباس ناسراو بە کوڕی حەفار بوو. ئەوان شۆڕشیان دەستپێکرد و مەنسور کوڕی ئیسحاق، کارگوزارەکەی خۆیان گرت و لەزیندانی ئەرك، زیندانییان کرد و بەناوی عەمرۆ کوڕی یەعقوب وتاریان خوێندەوە و سیستانیان خستە ژێر فەرمانی ئەو.

کاتێك هەواڵی ئەم پێشهاتە بەئەمیر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل گەیشت، سوپایەکی لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی ڕەوانە کرد و لەساڵی ٩١٣/٣٠٠ زایینی بۆ جاری دووەم هێرشی کردە سەر زەرەنج و بۆ ماوەی نۆ مانگ گەمارۆیدا. رۆژێك محەممەد کوڕی هورموزی سەندەلی هاتە سەر دیوارەکە و وتی: ئێوە چ کارێکتان

بەپیرەپیاوێك هەیە کەدەبێت پێبەندی سووچی پەرەستگایەك بێت؟ ئەو دەیویست وتەکانی عارزی بوخارییان بیربخاتەوە. دوای ماوەیەك سەندەلی مرد. دوای مەرگی ئەو عەمرۆ کوڕی یەعقوبی سەفار و کوڕی حەفار داوای ئەمانیان لەحسەین کرد و مەنسور کوڕی ئیسحاقیان لەزیندان هێنایەدەر. حسەین کوڕی عەلی، کوڕی حەفاری بەگەورە دەزانی و لەخۆی نزیکی کردەوە. کوڕی حەفار لەگەڵ دەستەیەك کەین و بەینی کرد تا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکاتە سەر حسەین و بیکوژێت. حسەین ئاگادار بوویەوە. کوڕی حەفار بێ ئەوەی کەس ڕێگەی لێ بگرێت دەهاتە بارەگاکەی حسەین. ڕۆژێك کەکوڕی حەفار هاتە لای حسەین، حسەین شمشێری لەژێر جلەکانیەوە شاردەوە. فەرمانیدا کوڕی حەفاریان گرت و ئەویان لەگەڵ خۆیان بۆ بوخارا برد.

کاتێك هەواڵی گرتنی سیستان بەئەمیر ئەحمەد گەیشت، سەمیجوری دەواتی وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان کرد و فەرمانیدا حسەین بگەڕێتەوە. حسەین لەگەڵ عەمرۆ کوڕی یەعقوب و کوڕی حەفار و دەستەیەکی دیکە گەڕانەوە. گەڕانەوەی ئەو لەزیحەجەی ٣٠٠/جولای ٩١٣ زایینی بوو. ئەمیر ئەحمەد مەنسور کوڕی مامی ئیسحاقی وەك فەرمانڕەوای نەیشابور دیاریکرد و ئەوی بۆ دیارە نارد. لەم ناوەدا کوڕی حەفار مرد.

## فەرمانبەری خەڵکانی سەقەلییە لەموقتەدر و گەڕانەوەی ئەوان بۆ فەرمانبەری کردن لەمەهدی عەلەوی

لەرووداوەکانی ساڵی ٢٩٧/٩١٠ زایینی باسمان کرد کەمەهدی، عەلی کوڕی عەمرۆی وەك کارگوزاری سەقەلییە دیاریکرد. ئەو کەپیرەپیاوێکی نەرم و نیان بوو، نەیتوانی بەکردەوەکانی خۆی خەڵکانی سەقەلییە رازی بکات لەبەر ئەمە ئەویان لابرد و ئەحمەد کوڕی قەرهەبیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد. کاتێك ئەو هاتەسەرکار، دەستەیەکی بۆ سەرزەمینی قەلوریە ڕەوانە کرد. ئەم دەستەیە تالآنی زۆری کۆکردەوە و دەستەیەك لەرۆمییەکانیان ئەسیر کرد و گەڕانەوە.

ئەحمەد لەساڵی ٣٠٠/٩١٣ زایینی عەلی کوڕی لەگەڵ سوپایەك بۆ قەلآی تازە دروست کراوی تەبەرمین ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا گەمارۆ بخاتە سەر ئەو شارە. مەبەستی ئەحمەد لەم کارە ئەوە بوو ئەگەر بەسەر ئەم قەلآیەدا سەرکەوێت، منالّ و سامان و کۆیلەکانی خۆی لەویّ نیشتەجیّ دەکات و ئەگەر ناسازگاری لەنێوان خۆی و خەڵکانی سەقەلییە هاتە ئاراوە، لەویّ پەنا بگرێت. کوڕەکەی بۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە بەلآم دواتر سوپاکەی رێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و مانەوەیان لەو شوێنە پەسەند نەکرد و خێوەتەکەی ئەویان سوتاند و بڕیاری کوشتنیاندا بەلآم عەرەبەکان رێگەیان لێگرتن.

ئەحمەد کوڕی قەرهەب پێشنیاری فەرمانبەری موقتەدری بەخەڵکان کرد و خەڵکان رازی بوون. ئەو لەسەقەلییە بەناوی موقتەدر وتاری خوێندەوە و چیتر ناوی مەهدی نەدەهاتە سەرزمان. کوڕی قەرهەب، هێزێکی دەریایی بۆ کەنارەکانی ئەفریقییە ڕەوانە کرد. ئەوان رووبەڕووی کەشتییە جەنگییەکانی مەهدی بەفەرماندەیی حەسەن کوڕی باوکی خێنزیر بوونەوە. کەشتییەکانیان سووتاند و حەسەنیان کوشت و سەری ئەویان بۆ لای کوڕی قەرهەب برد. کەشتییەکانی سەقەلییە بەرەو سەفاقوس ڕۆشتن بۆ ئەوەی وێرانی بکات. لەوێوە رێگەی تەرابلوسیان گرتەبەر و کاتێك لەویّ قائیم کوڕی مەهدیان بینی، بەناچاری گەڕانەوە. لەم کاتەدا دیاری و خەلآت و ئالآ ڕەشەکان لەلایەن موقتەدرەوە بەکوڕی

قەرهەب گەیشت. دواتر کوڕی قەرهەب کەشتییە جەنگییەکانی بۆ سەرزەمینی قەلوریە ڕەوانە کرد. سوپاکەی تالانی زۆری کۆکردەوە و قەلوریەی وێران کرد و گەڕایەوە. هەروەها چەندین کەشتی جەنگی بۆ ئەفریقییە نارد. لەوێ کەشتییەکانی مەهدی ڕووبەڕوویان بوویەوە و دەستی بەسەر کەشتییەکانی کوڕی قەرهەبدا گرت. دوای ئەمە چیتر بارودۆخ و هێزی کوڕی قەرهەب سەقامگیری بەخۆیەوە نەبینی و بەخت پشتی تێکرد و خەڵکان چاوی تەماحیان تێبڕی لەکاتێکدا پێشتر لێی دەترسان.

خەڵکانی جەرجەنت کەلێی دەترسان، ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و نامەیان بۆ مەهدی نووسی و دانیشتوانی شارەکانی دیکە، کاتێك ئەم بارودۆخەیان بینی، نامەیان بۆ مەهدی نووسی و لەشۆڕش و خوێنڕژان ترسان و دژی کوڕی قەرهەب شۆڕشیان کرد و لەساڵی ٣٠٠/٩١٣ زایینی ئەویان گرت و زیندانییان کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەکەسە نزیکەکانی ڕەوانەی بارەگای مەهدییان کرد. مەهدی فەرمانیدا کوڕی قەرهەب لەنزیك گۆڕی کوڕی باوکی خێنزیر بکوژن. کوڕی قەرهەب و هەموو کەسە نزیکەکانی کوژران. مەهدی، باوکی سەعید موسا کوڕی ئەحمەدی وەك فەرمانڕەوای سەقەلییە دیاریکرد و دەستەیەکی فراوان لەگەورەکانی کوتامەی کردە هاوڕێی ئەو. ئەوان گەیشتنە تەرابونوش.

هۆکاری ناردنی سوپا لەگەڵ باوکی سەعید ئەوە بوو کەکوڕی قەرهەب نامەی بۆ مەهدی نووسیبوو کەخەڵکانی سەقەلییە بەردەوام دژی فەرمانڕەواکانی خۆیان شۆڕش دەکەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوان نین و سامانی ئەوان دەرفێنن. ئەم سرشتەی ئەوان لەناو ناچێت مەگەر بەسوپایەکی گەورە کەسەرکوتیان بکات و گەورەکانی ئەوان لەناو ببات. مەهدی ئەو کارەی کرد. کاتێك باوکی سەعید لەگەڵ سوپا هاتە ناو سەقەلییە، دانیشتوانی شارەکە ترسان. خەڵکانی جەرجەنت و سەقەلەییە و شارەکانی دیکە بۆ جەنگ دژی باوکی سەعید یەکیانگرت. باوکی سەعید لەنزیك دەریا دیوارێکی بەدەوری خۆیدا کێشا و لەوێ سەنگەری گرت. لەنگەرگەی کەشتییەکانی لەوێ جێگیر کرد. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سەرئەنجام خەڵکانی سەقەلییە شکستیان خوارد و ژمارەیەك لەگەورەکانیان

کوژران و دەستەیەك ئەسیر کران و خەڵکان داوای ئەمانیان کرد.

باوکی سەعید ئەمانی بەهەمووان بەخشی مەگەر دوو کەس کەهەڵگیرسێنەری شۆڕشەکە بوون. خەڵکانی سەقەلییە شادمان و ئەو دوو کەسەیان تەسلیم بەباوکی سەعید کرد. باوکی سەعید ئەویانی بۆ لای مەهدی لەئەفریقییە نارد. باوکی سەعید دەستی بەسەر سەقەلییەدا گرت و دەروازەکانی وێران کرد. لەم کاتەدا نامەی مەهدی بەدەست گەیشت کەفەرمانی پێدەدا لەهەموان خۆش ببێت.

## مەرگی عەبدوللە کوڕی محەممەد فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس و هاتنە سەرکاری عەبدولرەحمانی ناسر

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حاکم کوڕی هوشام کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی معاویەی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، لەمانگی رەبیع الاوەل/ ئۆکتۆبەر مرد. ساڵەکانی ژیانی چل و دوو ساڵ درێژەی کێشا. ئەو سپی پێست، موو سوور و بالا نێوەنج بوو. قژی خۆی ڕەش دەکرد. بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ و دە مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد و یانزە کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت کەیەك لەوان محەممەدی کوژراو (مقتول) بوو کە لەیەکێك لەسنورەکان کوژرا. محەممەد باوکی عەبدولرەحمانی ناسرە.

کاتێك عەبدوللە کوڕی محەممەد مرد، کوڕی کوڕەکەی ئەو (محەممەد)، عەبدولرەحمانی ناسریان لەجێگەی ئەو دانیشاند. ناوی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حاکم کوڕی هوشام کوڕی عەبدولرەحمان، کەهاتە ناو ئاندۆلۆس و بناغەی حکومەتەکەی داڕشت، کوڕی معاویە کوڕی هوشام کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کوڕی حاکمی ئومەوی بوو. دایکی، دایکی منداڵ بوو بەناوی مەرتە. لەکاتی کوژرانی باوکی بیست رۆژە بوو.

داستانی فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرسوڕهێنەرە چوونکە گەنج بوو لەکاتێکدا مام و مامەکانی باوکی هێشتا زیندوو بوون بەڵام سەبارەت بەو ناکۆکی نەهاتە ئاراوە

و هەموو شارەکانیان خستە ژێر فەرمانی ئەو. ئەم دەستەیە پێشتر سەبارەت بەو کۆك نەبوون. تەنیا چەند قەلا لەئابادەك ڕییە و قەلایەك لەبوشتەر بەفەرمانڕەوایەتی ئەو رازی نەبوون. عەبدولرەحمان دژی ئەوان جەنگی و بارودۆخی ناوچەکەی سەقامگیر کرد. خەلکانی تەلیتەلە (تۆلدۆ) ملکەچی فەرمانەکانی نەبوون و لەگەل ئەوانیش جەنگی و بۆ فەرمانبەری ناچاری کردن. ئەو بەردەوام لەگەل نەیارەکانی دەجەنگا تا هەمووان گوێڕایەلی فەرمانەکانی بوون و بۆ ماوەی بیست و چەند سال فەرمانڕەوایەتی کرد و بارودۆخی ولات سەقامگیر و ئاسوودەیی بەخۆیەوە بینی تا ئەو کاتەی عەبدولرەحمان کۆچی دوایی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم سالەدا عەبدوللە کوڕی ئیبراهیمی مەسمەعی لەفارس و کرمان دوورخرایەوە و بەدری حومامی لەسەر تەخت دانیشت. بەدر، پێشتر فەرمانڕەوای ئیسفەهان بوو ودوای ئەو عەلی کوڕی وەهسوزانی دەیلەمی فەرمانڕەوایەتی ئیسفەهانی گرتەدەست.

لەم سالەدا هەوالی پەیکی کارگوزاری ڕەققە کە لەچوار فەرسەنگی میسر و لەولای کەنارەکانی مەغریب بوو، گەیشتە بەغداد کەپیاوێکی خارجی دژی ئەوان شۆڕشی کردووە و ئەوان توانیویانە بەسەر خۆی و سوپاکەی زالبن و ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژن. لوت و گوێچکەی براوی ژمارەیەکی زۆر لەکوژراوەکان لەگەل ئەم پەیکەدا بۆ بەغداد نێردرابوون.

لەم سالەدا نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان لەبەغداد بلاو بوویەوە.

لەم سالەدا سەگ و گورگەکان لەسارا گرفتاری نەخۆشی هاری بوون و ژمارەیەکی زۆر لەخەلکانیان کوشت.

لەم سالەدا بشر ئەفشین فەرمانڕەوایەتی تەرسوسی پێبڕا.

لەم سالەدا حەرەمین و سنورەکان بەمونس کوڕی موزەفەر سپێردرا.

لەم سالەدا ئەستێرەکان (بەردە ئاسمانییەکان) لەرۆژهەلاتی ئاسمان بارین.

لەم سالەدا ئەسکەندەروس کوڕی لاون، پاشای رۆم مرد و دوای ئەو کوڕەکەی

بەناوی کونستانتین لەتەمەنی دوانزە ساڵیدا جێگەی باوکی گرتەوە.

لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی عەبدولله کوڕی تاهیر کوڕی حسەین مرد. ئەو لەساڵی ٨٣٧/٢٢٣ زایینی لەدایك بوو.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی عەلی ئاسنگر مرد. دەستەیەك ساڵی مەرگی ئەو بە٩١٢/٢٩٩ زایینی دەزانن.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی یەعقوب برازای عێرەقی موقری و حسەین کوڕی عومەر کوڕی باوکی ئەحوەس و عەلی کوڕی تیفوری نەسەوی و باوکی عومەری قەتات هەموویان مردن.

لەرەبیع الاخر/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە یەحیا کوڕی عەلی کوڕی یەحیای ئەستێرەناس، ناسراو بەنەدیم، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و یەکی کۆچی ( ٩١٤ زایینی )

لەم ساڵەدا بەئەمیر باوکی عەباس کوڕی موقتەدر باللە خەڵات بەخشرا و کەنارەکانی میسر و مەغریب بەو سپێردرا لەکاتێکدا هێشتا تەمەنی چوارساڵ بوو. مونسی خزمەتکار وەك نوێنەری ئەو فەرمانڕەوایەتی میسری گرتەدەست. باوکی عەباس ئەو کەسەیە دوای قاهر باللە لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت و نازناوی رازی باللە (راضی باللە)ی پێبرا.

لەم ساڵەدا بەئەمیر عەلی کوڕی موقتەدریش خەڵات بەخشرا و ڕەی، دەماوەند، قەزوێن، زەنجان و ئەبهەر کەوتە ژێر فەرمانی ئەو.

لەم ساڵەدا پیاوێك بەناوی حەلاج و نازناوی باوکی محەممەدیان بردە ماڵی عەلی کوڕی عیسای وەزیر. دەستەیەك ئەویان بەتەڕدەست دەزانی. یەکێك لەهاوڕێکانی لەگەڵدا بوو. دەوترا کەبانگەشەی خواوەندی دەکات. سێ ڕۆژ خۆی و هاوڕێکەیان لەداردا و هەموو ڕۆژێك لەبەرەبەیانەوە تا نیمەڕۆ بەدارەکانەوە دەمانەوە و دواتر فەرمانی زیندانی کردنیان دەرکرا. بەسەرهاتی ئەو و ناسازگاری خەڵکان سەبارەت بەو لەکاتی خۆیدا باس دەکەین.

لەسەفەر/ سێپتامبەری ئەم ساڵە، باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان لەفەرمانڕەوایەتی موسڵ دوورخرایەوە و حکومەتی موسڵ بەیومنی تولونی سپێردرا بەڵام لەم ساڵەدا یومن لەم کارە دوورخرایەوە و نەحریزی خزمەتکار جێگەی گرتەوە.

لەم ساڵەدا باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان دژی موقتەدر شۆڕشی کرد و مونسی موزەفەر بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرا. جڵەوداری ئەم سوپایە بەنی کوڕی نەفیس بوو. ئەو لەنیوەی سەفەر/ بیست و یەکی سێپتامبەر لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان هێرشی کردە سەر موسڵ و مونس لەرەبیع الاوەل/ ئۆکتۆبەر هاتەدەر. کاتێك باوکی هەیجا ئاگادار بوویەوە، مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای مونسی کرد تا ئەمان بۆ خۆی وەربگرێت. ئەو لەگەڵ مونس هاتە بەغداد و موقتەدر

خەڵاتی پێبەخشی.

لەم ساڵەدا دەمیانە، فەرمانڕەوای سنورەکان و دەریای ڕۆم، مرد و کوڕی بەلەك جێگەی ئەوی گرتەوە.

## کوژرانی ئەمیر باوکی نەسر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی و هاتنە سەرکاری نەسری کوڕی

لەم ساڵەدا ئەمیر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەدی سامانی، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهر کوژرا. ئەو حەزی لەڕاو دەکرد و بەمەبەستی ڕاو ڕۆشتە فەربەر. کاتێك لەراو گەڕایەوە فەرمانیدا پاشماوەی ئوردووگاکەی بسوتێنن و بەرێکەوتن بەلاّم لەم کاتەدا نامەیەکی لەکارگوزارەکەی لەتەبەرستان، باوکی عەباسی سەعلوك، بەدەست گەیشت. ئەو دوای مەرگی کوڕی نوح فەرمانڕەوایەتی ئەم ناوچەی دەکرد. ئەو لەم نامەدا ئەحمەدی لەدەرکەوتنی حەسەن کوڕی عەلی عەلەوی ئەتروش لەتەبەرستان ئاگادار کردبوویەوە. لەنامەکەدا نووسیبووی حەسەن دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرتووە و ئەوی لەوێ دەرپەڕاندووە. ئەم هەواڵە ئەحمەدی خەمبار کرد و بۆ ئوردووگاکەی خۆی گەڕایەوە کەسووتاندبووی. لەهەمان ئوردووگا دابەزی و خەڵکەکەی بەشێوەیەکی خراپ لێکدانەوەیان بۆ مانەوەی ئەو لەو شوێنە کرد (چوونکە دوای سووتاندنی ئوردووگاکەی جارێکی دیکە لەوێ ئوردووی لێدا).

ئەو شێرێکی هەبوو هەموو شەوێك لای شوێن خەوەکەی خۆی دەیبەستەوە و چیتر کەس نەیدەوێرا لێی نزیك ببێتەوە. ئەو شەوە لەبەستنەوەی شێرەکە لەنزیك شوێن خەوەکەی کەمتەرخەمییەکان کرد و هەمان شەو دەستەیەك لەکۆیلەکانی هێرشیان کردە سەر خێوەتەکەی و لەناو جێگەکەی سەریان بڕی و هەلاّتن. کوژرانی ئەو لەشەوی پێنجشەممە بیست و سێی جومادی الاخرە/ بیست و پێنجی ژانویەی ساڵی ٩١٤/٣٠١ زاییني روویدا. جەنازەکەیان بردە بوخارا و لەوێ بەخاکیان سپارد. لەم کاتەدا نازناوی شەهیدیان پێبەخشی و شوێن بکوژەکانی

کەوتن و دەستەیەکیان کوشت.

دوای ئەو کوڕەکەی باوکی حەسەن نەسر کوڕی ئەحمەدی هەشت ساڵە هاتەسەر کار. حەسەن، سی ساڵ و سی و سێ ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد و لەرەجەبی ساڵی ٣٣١/ مارسی ٩٤٢ زایینی مرد. نازناوی سەعیدیان پێبەخشی و هاوەڵانی باوکی دوای بەخاك سپاردنی باوکی لەبوخارا بەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەو کەسەی بەیعەتی وەرگرت، ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی لەیس بوو کەفەرمانڕەوایەتی بوخارای دەکرد. ئەو، باوکی حەسەنی خستە سەرشان و بەیعەتی بۆ وەرگرت. کاتێك کۆیلەکانی باوکی ئەویان دەخستە سەرشان بۆ ئەوەی خەڵکان بیبینن، حەسەن ترسا و بەکۆیلەکانی باوکی وت: دەتانەوێت وەك باوکم بمکوژن؟ وتیان: نە، دەمانەوێت، تۆ هاوشێوەی باوکت پاشا بیت.باوکی حەسەن ئارام بوویەوە.

خەڵکان، باوکی حەسەن نەسر کوڕی ئەحمەدیان بەناتەوان و منالّ لەقەڵەمدا و گومانیان کرد بەبوونی مامی باوکی، ئەمیر ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کەوەك گەورەی سامانییەکان هەژمار دەکرا و فەرمانڕەوایەتی سەمەرقەندی دەکرد، بارودۆخ بۆ باوکی حەسەن سەقامگیر نابێت بەتایبەت ئەوەی کەخەڵکانی ماوەرائەلنەهر جگە لەدانیشتوانی بوخار خوازیاری فەرمانڕەوایەتی ئیسحاق و کوڕەکانی ئەو بوون. راپەڕاندنی کاروبارەکانی حکومەتی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد بەباوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی ئەحمەدی جیهانی سپێردرا و ئەو کاروبارەکانی هەڵدەسوڕاند و وڵاتی بەڕێوەدەبرد. ئەو لەگەڵ پیاوانی حکومەتی نەسر بەباشترین شێوە کاروباری وڵاتی بەڕێوەبرد بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەم لاولا چاوی تەماحیان دەبڕییە ئەم سەرزەمینە و بەهەمان شێوە کەئاماژەی پێدەدەین، لەناوچە جیاجیاکانەوە ئاگری شۆڕش بڵێسەی سەند.

ئەو کەسانەی ملکەچی فەرمانەکان نەبوون، خەڵکانی سیستان بوون و مامی باوکی ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەسەد لەسەمەرقەند و دوو کوڕەکەی ئەو مەنسور و ئەلیاس و هەروەها محەممەد کوڕی حسەین کمت و باوکی حەسەن کوڕی یوسف و حسەین کوڕی عەلی مەروروزی و محەممەد کوڕی حەید و ئەحمەد

کوڕی سەهل و لەیلی کوڕی نوعمان، فەرمانڕەوای عەلەوییەکان تەبەرستان و سەمیجور لەگەڵ باوکی حەسەن کوڕی ناسر و قەراتکین و ماکان کوڕی کالی هاوڕێیەتی نەسریان کرد بەڵام براکانی کالی یەحیا و مەنسور و ئیبراهیم، منداڵەکانی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل، و جەعفەر کوڕی باوکی جەعفەر و کوڕی داود و محەممەد کوڕی ئەلیاس و نەسر کوڕی محەممەد کوڕی مت و مەرداویج و وەشمگیر دوو کوڕەکەی زیار دژی ئەو شۆڕشیان کرد بەڵام نەسر کوڕی ئەحمەد سەرکەوتنی بەسەر هەموویاندا بەدەست هێنا.

## چۆنیەتی بارودۆخی سیستان

کاتێك ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوژرا، دانیشتوانی سیستان لەگەڵ منداڵەکەی ئەو نەسر ناسازگارییان کرد و سەمیجوری دەواتی پشتی کردە سیستان و موقتەدر، بەدری گەورەی لەجێگەی ئەو دانا و بەدر، فەزڵ کوڕی حەمیدی لەگەڵ باوکی یەزید خالید کوڕی محەممەدی مەروزی بەنوێنەرایەتی خۆی ڕەوانە کرد. لەم کاتەدا عوبەیدالله کوڕی ئەحمەدی جیهانی لەبۆست بوو و روخج و سەعدی تاڵەقانی لەلایەن سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد لەغەزنە بوون. فەزڵ و خالید، مەبەستی عوبەیدالله و سەعدی تاڵەقانییان کرد. عوبەیدالله کەتوانای خۆڕاگری نەبوو، هەڵات و ئەو دووانە سەعدیان گرت و ڕەوانەی بەغدادیان کرد. فەزڵ و خالید، غەزنە و بۆستیان خستە ژێر فەرمانی خۆیانەوە. دواتر فەزڵ نەخۆش کەوت و خالید بەتەنیایی کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد. خالید دژی خەلیفە شۆڕشی کرد و خەلیفە، دەرك برای نەجحی تولونی بۆ جەنگی ئەو نارد بەڵام خالید شکستیدا.

خالید بەرەو کرمان بەرێکەوت و بەدر سوپایەکی بۆ ئەو شارە نارد. خالید ڕووبەڕووی ئەم سوپایە بوویەوە و بریندار بوو و هاوەڵانی هەڵاتن و خۆی ئەسیر کرا و ماوەیەك دواتر مرد و سەری ئەویان بۆ بەغداد نارد.

## شۆڕشی ئیسحاق کوڕی ئەحمەد و ئەلیاسی کوڕی

لەم ساڵەدا، ٣٠١/٩١٤ زایینی، مامی باوکی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل، ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەسەد و کوڕەکەی ئەلیاس دژی سەعید ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە. کاتی کوژرانی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل و جێگری کوڕەکەی نەسر کوڕی ئەحمەد، ئیسحاق لەسەمەرقەند بوو. کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە وکوڕەکەی وەك فەرماندەی سوپاکەی دەستنیشان کرد و پێگەی ئەم دووانە بەرز بوویەوە. بەرەو بوخارا ئەسپیان غاردا. حەمویە کوڕی عەلی لەگەڵ سوپایەك لەمانگی رەمەزان/ مارس رووبەرووی بوویەوە و دوو سوپا ئاگری جەنگیان خۆش کرد و ئیسحاق بۆ سەمەرقەند هەڵات. ئەو جارێکی دیکە سوپای کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر حەمویە کوڕی عەلی. شەڕێکی قورس دەستیپێکرد و ئەمجارەیش ئیسحاق هەڵات و حەمویە تا سەمەرقەند شوێنی کەوت و بەزۆر دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت.

ئیسحاق خۆی شاردەوە و حەمویە بەدوایدا دەگەڕا و بۆ گرتنی ئەو سیخورەکانی دانا. ئیسحاق لەشوێنی مانەوەی خۆی بێزار بوو و هاتەدەر و داوای ئەمانی لەحەمویە کرد. حەمویە ئەمانی پێبەخشی و ڕەوانەی بوخارای کرد و لەوێ مایەوە تا مرد.

کورەکەی ئیسحاق، ئەلیاس بەرەو فەرغانە ڕۆشت و ا یێ مایەوە تا ئەو کاتەی بۆ جاری دووەم ئاڵاشی شۆڕشی بەرز کردەوە.

## دەرکەوتنی حەسەن کوڕی عەلی ئەتروشی

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرت. نازناوی ئەو ناسرە.

وەك وتوومانە و دەیڵێین هۆکاری ئەو لەم بزوتنەوەیە، سەرکێشی محەممەد کوڕی هارون دژی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل و هەڵاتنی محەممەد کوڕی هارون بوو. دوای ئەم رووداوە ئەمیر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل، باوکی عەباس عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی نوحی وەك فەرمانڕەوای تەبەرستان دیاریکرد. ئەم کەسە لەناو خەڵکانی تەبەرستان هەڵس و کەوتی چاکەکارانەی گرتەبەر و دادپەروەری کردەپیشە و ڕێزی لەعەلەوییەکانی ئەو دیارە گرت و چاکەی لەگەڵ کردن و نامەی بۆ گەورەکانی دەیلەم نووسی و دیاری گرانبایی بۆ نارد و خۆشەویستی خۆی نیشاندان.

حسەین کوڕی عەلی ئەتروشی دوای کوژرانی محەممەد کوڕی زەید هاتە دەیلەم و سیانزە ساڵ لەناو ئەواندا مایەوە و بانگەوازی ئیسلامی بڵاو دەکردەوە و بەگرتنی دەیەکی سامانی ئەوان (زەکات) بەسەندەی دەکرد. کوڕی حەسان بەرگری لەسامانەکەی ئەو دەکرد. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئەم شارە باوەڕیان بەئیسلام هێنا و لەدەوری حەسەن کوڕی عەلی کۆبوونەوە و لەسەرزەمینەکەی خۆیان بناغەی چەندین مزگەوتیان داڕشت.

موسوڵمانان لەبەرابەر خۆیان سنورەکانی وەك قەزوێن، سالوس(چالوس) و شوێنەکانی دیکەیان دەبینی. قەڵایەکی کۆن لەشاری چالوس بەرچاو دەکەوت. کاتێك خەڵکانی دەیلەم و گیلان باوەڕیان بەئیسلام هێنا، ئەتروشی ئەم قەڵایەی وێران و داوای لەخەڵکان کرد لەگەڵ ئەو بەرەو تەبەرستان بەرێکەون و ئەوان لەبەر حەسان کوڕی نوح بەداواکەی رازی نەبوون. ئەمیر ئەحمەد، کوڕی نوحی لەتەبەرستان لابرد و سەلامی لەجێگەی ئەو دانیشاند. سەلام خراپەکاری

کردەپیشە و نەیتوانی کاروبارەکانی ئەو دەڤەرە بەڕێوە ببات و خەڵکانی دەیلەم شۆڕشیان کرد. سەلام ڕووبەڕوویان بوویەوە وسەرکوتی کردن بەلاّم دوای ئەوە دەستی لەفەرمانڕەوایەتی ئەوان هەڵگرت. ئەمیر ئەحمەد ئەوی لابرد و کوڕی نوحی بۆ سەرکارەکەی گەڕاندەوە و بەهاتنی کوڕی نوح، بارودۆخ سەقامگیر بوو. دواتر کوڕی نوح لەتەبەرستان مرد و خەلیفە، باوکی عەباس محەممەد کوڕی ئیبراهیمی سەعلوکی لەجێگەی ئەو دانا. باوکی عەباس گۆڕانی لەشێوازی کوڕی نوح دروست کرد و خراپەکاری گرتەبەر. چیتر دیاری بۆ گەورەکانی دەیلەم نەنارد (کوڕی نوح دیاری بۆ دەناردن). حەسەن کوڕی عەلی لەم بارودۆخە کەڵکی برد و دەیلەمییەکانی دژی ئەو هاندا و داوای لێکرد لەگەڵ ئەو شۆڕش بکەن. خەڵکان ڕازی بوون و لەگەڵ ئەو ئالاّی شۆڕشیان بەرز کردەوە. سەعلوك مەبەستی ئەوانی کرد ولەشوێنێك بەناوی نەوڕۆز لەکەنار دەریا کەیەك ڕۆژ لەچالوسەوە دوور بوو، ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرئەنجام سەعلوك شکستی خوارد و نزیکەی چوارهەزار کەس لەسوپاکەی کوژران. ئەتروش پاشماوەکانی ئەسیر کرد. سەعلوك خۆی هەلاّت. حەسەن دواتر ئەمانی بەگیان و سامان و بنەماڵەکانیان بەخشی. ئەوان لەدەوری ئەتروش کۆبوونەوە و ئەمانی بەهەموویان بەخشی و دواتر ڕێگەی ئامولی گرتەبەر. حەسەن کوڕی قاسم، بانگەوازکەری عەلەوی، کەزاوای ئەتروش بوو، گەیشتە چالوس و هەموانی کوشت چوونکە نەئەمانی پێبەخشیبوون و نەپەیمانی دابوو. بەم شێوەیە ئەتروش دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرت.

سەعلوك لەساڵی ٩١٣/٣٠١ زایینی ڕێگەی شاری ڕەی گرتەبەر و لەوێوە بەرەو بەغداد ڕۆشت. دەیلەمییەکانی ئەولای سفید ڕوود تا کەنارەکانی ئامول لەسەر دەستی ئەتروش باوەڕیان بەئیسلام هێنابوو (شیعە). ئەتروش خۆی شوێنکەوتەی ئایینی زەیدی بوو، وتاردەرێکی زمان پاراو، زانا و شارەزای زانستە ئیسلامییەکان و نەترس و بوێر بوو.

دەگێڕنەوە: ئەو، عەبدوللە کوڕی موبارەکی وەك کارگوزاری گورگان دیاریکرد. ئەو بەوە ناوی دەرکردبوو کەپیاوان ئەو کارەی لەگەڵ دەکەن کە لەگەڵ ژنان دەیکەن. ڕۆژێك حەسەن لەکارێکدا بەناتەوانی لەقەڵەمدا و سەرکۆنەی کرد.

عەبدوللە وتی: ئەی ئەمیر، پێویستم بەپیاوە بەهێزەکان هەیە تا هاوکاریم بکەن. حەسەن وتی: دەزانم.[٣]

چۆنیەتی ناونانی ئەو بەئەتروش (کەڕ) لەوێوە سەرچاوە گرتووە کە لەجەنگ لەگەڵ محەممەد کوڕی زەید شمشێرێك بەرسەری کەوت و بەم پێیە هەستەوەری بیستنی خۆی لەدەستدا. منداڵەکانی ئەو باوکی حەسەن، باوکی قاسم و باوکی حسەین بوون. ڕۆژێك ئەتروش بەباوکی حەسەنی وت: کوڕم! ئایا لەوێ سرێش دەستدەکەوێت تا کاغەزێکی پی بلکێنم. باوکی حەسەن وەڵامی دایەوە: نا لێرە سرێش دەستناکەوێت و ئەوەی دەست دەکەوێت شیاکەی چوارپێکانە. ئەتروش بەبیستنی ئەم وەڵامە بیٚ ئەدەبانە ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و چیتر ئەوی وەك فەرمانڕەوای هیچ شوێنێك دەستنیشان نەکرد و فەرمانڕەوایەتی بەدوو کوڕەکەی دیکەی باوکی قاسم و باوکی حسەین دەدا. باوکی حەسەن لەوەی پەراوێز خرابوو، سکاڵای بەرز کردەوە و دەیوت: ڕەچەڵەکی من لەوان گەورەترە، چوونکە دایکی من حسەینییە و ئەو دوانە کەنیززادەن.

باوکی حەسەن وتاردەر و لەگەڵ کوڕی موعتەز (خەلیفەی یەك ڕۆژە) شەڕە هۆنراوەیان هەبووە. ئەو بەناچاری باوکی بەجێهێشت و پەیوەستی کوڕی باوکی ساج (فەرمانڕەوای ئازەربایەجان و تەبەرستان) بوو. ڕۆژێك لەگەڵ ئەو ڕۆشتە ڕاو و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. لەسەر زەوی مایەوە تا ئەوەی کوڕی باوکی ساج لایەوە تێپەڕی و پێی وت: سوار ئەسپەکەی من بە. باوکی حەسەن وتی: دوو پاڵەوان شیاو نییە لەسەر یەك ئەسپ.

---

[٣]- مەبەست ئەوەیە زیاتر حەزی کردووە پیاوەکان لێی نزیك بکەونەوە یان بەواتایەکی دیکە حەزی لەڕەگەزی نێرینە بووە لێی جووت ببێت. (وەرگێڕ)

## چۆنیەتی بەسەرهاتی قەرەمتییەکان و کوژرانی جونابی

لەم ساڵەدا باوکی سەعید حەسەن کوڕی بەهرامی جونابی، گەورەی قەرەمتییەکان کوژرا. خادمی سەقلەبی لەناو گەرماودا کوشتی. کاتێك ئەوی کوشت، یەکێك لەگەورەکانی بانگ کرد و وتی: سەروەرم بانگی تۆ دەکات. کاتێك ئەو کەسە رۆشتە ژوور، ئەویشی کوشت و ئەم بەڵای بەسەر چوارکەس لەگەورەکان هێنا و کەسی پێنجەمی بانگ کرد. کاتێك کەسی پێنجەم ڕۆشتە ناو گەرماوەکە، هەستی بەرووداوەکە کرد، دەستی خادمی گرت و دەنگی بەرز کردەوە. خەڵکان ڕژانە ناو گەرماوەکە و ژنان شین و گریانیان دەستپێکرد. سەرئەنجام خادمیان کوشت.

باوکی سەعید، سەعیدی کوڕی وەك جێگری خۆی دیاریکردبوو. سەعید کەکوڕە گەورەی ئەو بوو، لەبەرێوەبردنی کارەکان ناتەوان بوو. برابچووکەکەی باوکی تاهیر سلێمان کەزۆرانبازێکی بوێر و چاونەترس بوو، سەرکەوتنی بەسەر برا گەورەکەی بەدەست هێنا. ئەو هەواڵانەی لەتاهیری دەگێڕنەوە، نیشانەی ئازایەتی و بەتوانایی ئەوە.

باوکی سەعید، پێش مەرگ، هەجەر و ئیحسا و قەتیف و تائیفی و شارەکانی بەحرەینی لەژێر فەرماندا بوو. موقتەدر نامەیەکی بۆ نووسی و داوای ئەسیرە موسوڵمانەکانی کرد کەلای ئەو بوون و چەندین بەڵگەی بۆ راست نەبوونی ئایینەکەی ئەو هێنایەوە. موقتەدر نامەکەی بەچەند نوێنەرێك بۆ لای باوکی سەعید نارد. کاتێك نوێنەرەکان گەیشتنە بەسرە، هەواڵی مەرگی باوکی سەعیدیان بیست و خەلیفەیان لەم رووداوە ئاگادار کردەوە. خەلیفە فەرمانی پێدان بڕۆنە لای کوڕەکەی. ئەوان نامەکەیان بۆ باوکی تاهیر برد. باوکی تاهیر ڕێزی لەنوێنەرەکان گرت و ئەسیرە موسوڵمانەکانی ئازاد و ڕەوانەی بەغدادی کردنەوە و وەڵامی نامەکەی موقتەدری دایەوە.

## ڕۆشتنی سوپای مەهدی بۆ میسر

لەم ساڵەدا مەهدی سوپاکەی خۆی لەئەفریقییە کۆکردەوە و بەفەرماندەیی باوکی قاسمی کوڕی بەرەو میسر ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە گەیشتە بەرقە و لەزیحەججە/ جون دەستی بەسەردا گرت. دواتر ڕێگەی میسری گرتەبەر و ئەسکەندەرییە و فیومی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و بەشی زۆری سەرزەمینی میسریان کۆنترۆڵ کرد. باوکی قاسم بارودۆخی لەسەر دانیشتوانی شارەکان دژوار دەکرد. موقتەدر باللە مونسی خزمەتکاری لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. سوپاکەی مونس دژی سوپاکەی باوکی قاسم جەنگی و ئەوانی لەمیسر دوورخستەوە و سوپاکەی باوکی قاسم هەڵات وبۆ مەغریب گەڕانەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا نەخۆشییە خوێنییەکان لەعێراق بڵاوبوویەوە و بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن کەزۆربەیان لەدانیشتوانی حەربییە بوون. دەرگای ژمارەیەکی زۆر لەماڵەکان داخران چوونکە هەموو ئەندامەکانی مردبوون.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی حەسەنی فاریابی لەبەغداد و قازی باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری موقەدەمی سەقەفی، کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و دووی کۆچی ( ٩١٥ زایینی )

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عیسای وەزیر فەرمانیدا سوپا بۆ جەنگی هاوینە بەرەو تەرسوس بەڕێکەوێت. ئەم سوپایە لەگەڵ دوو هەزار سوار بەبیشری خزمەتکار، فەرمانڕەوای تەرسوس پەیوەست بوو تا بەرەو ڕۆم بڕوات بەڵام چوونکە جەنگ کەوتە وەرزی زستانەوە و سەرما و باو و بۆران تەنگی پێهەڵچنین، شەڕ ڕوویندا.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەلی ئەتروشی عەلەوی دوای زاڵبوون بەسەر ئامول لەفەرمانڕەوایەتی ئەو شارە دەستی هەڵگرت -وەك ئاماژەی پێدرا- و بەرەو چالوس بەڕێکەوت. سەعلوك سوپایەکی لەشاری ڕەی بەرەو چالوس ڕەوانە کرد و حەسەن ڕووبەڕووی بوویەوە بەڵام شکستی خوارد و بۆ ئامول گەڕایەوە.

حەسەن کوڕی عەلی پیاوێکی چاکەکار و دادپەروەر بوو. خەڵکان هاوشێوەی ئەویان نەبینیوە بەم شێوەیە دادپەروەری لەناو خەڵکاندا بڵاو بکاتەوە و بەرگری لەڕاستی بکات. کوڕی مەسکویە لەکتێبی تجارب الامم ئاماژە بەم تایبەتمەندییانە دەدات و دەڵێت: حەسەن کوڕی عەلی داعی[٤] ئەو نەبوو، بەڵکو داعی، عەلی کوڕی قاسم بوو کەزاوای حەسەن کوڕی عەلییە و پێشتر ئاماژەمان پێدا.

لەم ساڵەدا موقتەدر، باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی عەبدوللە ناسراو بەکوڕی جەساسی جەوهەری گرت و سامانەکەی زەوت کرد. بەهای کاڵاکانی ناو ماڵەکەی بەچوارهەزار هەزار دینار خەمڵێنرا. ئەو خۆی دەیوت بەهای کەڵاکانی کەتاڵان کراوە زیاتر لەبیست هەزار هەزار دینار بووە.

---

[٤]- داعی: خوازیار، ئەو کەسەی دۆعا دەکات، ئەو کەسەی بانگەشەی ئایین و مەزهەب بەخەڵکان دەکات. (وەرگێڕ)

## شۆڕشی مەنسور کوڕی ئیسحاق

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەسەد لەگەڵ ئەمیر نەسر کوڕی ئەحمەد ناسازگاری کرد. حسەین کوڕی عەلی مەرورووزی و محەممەد کوڕی حەید لەم ناسازگارییەدا هاوڕێ مەنسور بوون.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك حسەین کوڕی عەلی سیستانی بۆ یەکەم جار بۆ ئەمیر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل گرت – ئاماژەی پێدرا– چاوەڕوان بوو وەك فەرمانڕەوای ئەو شارە دەستنیشان بکرێت بەڵام ئەمیر ئەحمەد، مەنسور کوڕی ئیسحاقی وەك فەرمانڕەوا دانا. دانیشتوانی سیستان ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و مەنسوریان زیندانی کرد. ئەمیر ئەحمەد دووبارە حسەین کوڕی عەلی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد و حسەین بۆ جاری دووەم دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و دووبارە هیوادار بوو فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی پێببڕێت بەڵام ئەمیر ئەحمەد سەمیجوری بۆ ئەو کارە راسپارد. پێشتر باسی ئەم گێڕانەوەمان کرد.

کاتێك سەمیجور فەرمانڕەوایەتی سیستانی گرتەدەست، حسەین کوڕی عەلی ڕەنجا و خۆی بەدوور گرت و دوای مەرگی ئەمیر ئەحمەد لەگەڵ مەنسور کوڕی ئیسحاق یەکیانگرت تا خوراسان بکەوێتە ژێر فەرمانی مەنسور کوڕی ئیسحاق و ئەو ببێتە جێگری مەنسور کوڕی ئیسحاق لەخوراسان. هەردووك سازان و کاتێك ئەمیر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوژرا، مەنسور کوڕی ئیسحاق لەنەیشابور و حسەین کوڕی عەلی لەهەرات بوو. حسەین کوڕی عەلی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و بەرەو لای مەنسور بەرێکەوت و ئەوی بۆ ئەنجامدانی پەیمانەکەیان هاندا و بەناوی مەنسور لەنەیشابور وتاری خوێندەوە. حەمویە کوڕی عەلی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەم دوانە لەبوخاراوە ڕەوانە کرا و لەم ناوەدا مەنسور کوڕی ئیسحاق مرد و دەستەیەك گومان دەکەن حسەین کوڕی عەلی ژەهر خواردی کردووە. کاتێك حەمویە نزیك بوویەوە، حسەین کوڕی عەلی نەیشابوری بەجێهێشت و بەرەو هەرات گەرایەوە و لەوێ نیشتەجێ بوو.

محەممەد کوڕی حەید لەکۆنەوە فەرماندەی پاسەوانەکانی بوخارا بوو. ئەو بۆ ئەنجامدانی ئەرکێك لەبوخارا ڕەوانەی نەیشابور کرا. ئەو ڕۆشتە ناو نەیشابور بەڵام بێ وەرگرتنی مۆڵەت گەڕایەوە. نامەیەکی لەبوخاراوە بەدەست گەیشت کەبۆ بوخارای

بەجێهێشتووە. محەممەد کوڕی حەید لەگیانی خۆی ترسا و لەنیوەی رێگە بەرەو هەرات و لای حسەین کوڕی عەلی بەرێکەوت. حسەین کوڕی عەلی لەهەراتەوە هێرشی کردە سەر نەیشابور و براکەی مەنسور کوڕی عەلی وەك جێگری خۆی لەهەرات دانا و دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت. ئەحمەد کوڕی سەهل لەبوخارا مەبەستی جەنگی حسەینی کرد و سەرەتا گەمارۆی خستە سەر هەرات و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. مەنسور کوڕی عەلی داوای ئەمانی کرد. ئەحمەد لەهەراتەوە هێرشی کردە سەر نەیشابور و لەرەبیع الاوەلی ٣٠٦/ ئۆگۆستی ٩١٨ زایینی گەیشتە ئەو دەڤەرە. ئەو لەنزیك حسەین دابەزی و ناکاوگیری کرد و ئاگری جەنگی هەڵگیرساند. هاوەڵانی حسەین کوڕی عەلی هەڵاتن و حسەین، ئەسیر کرا. ئەحمەد کوڕی سەهل لەنەیشابور مایەوە.

شیاو بوو چۆنیەتی زاڵبوونی ئەحمەد لەنەیشابور و ئەسیر کرانی حسەین کوڕی عەلی لەساڵی ٩١٨/٣٠٦ زایینی شی بکەینەوە بەڵام بەباشمان زانی ئەم رووداوە پێکەوە باس بکەین تا سەرەتاکەی بیر نەچێتەوە.

محەممەد کوڕی حەید لەکاتی ئاگادار بوون لەسەرکەوتنی ئەحمەد کوڕی سەهل لەنەیشابور و گرفتاری حسەین کوڕی عەلی، لەمەرو بوو. ئەو بۆ لای ئەحمەد بەرێکەوت. ئەحمەد ئەوی گرت و سامان و باروبنەکەی لێسەند و لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی رەوانەی بوخارای کرد. دواتر محەممەد کوڕی حەید بۆ خوارەزم دوورخرایەوە و تا کاتی مردن لەوێ مایەوە.

حسەین کوڕی عەلی لەبوخارا زیندانی کرا و ئەوەندە لەزیندان مایەوە تا باوکی عەبدوڵلەی جیهانی ئەوی لەزیندان هێنایەدەر و دووبارە پەیوەستی ئەمیر نەسر کوڕی ئەحمەد بوویەوە.

رۆژێك حسەین کوڕی عەلی لای ئەمیر نەسر بوو، ئەمیر داوای ئاوی کرد. ئاویان لەناو گۆزەیەکی ناشیریندا هێنا. لەم کاتەدا حسەین کوڕی عەلی بەئەحمەد کوڕی حەمویەی وت: ئایا باوکی تۆ لەنەیشابورەوە بۆ ئەمیر لەگۆزە جوانەکان بەدیاری ناهێنێت.؟ ئەحمەد وەڵامی دایەوە: باوکی من پیاوانی وەك تۆ و ئەحمەد کوڕی سەهل و لەیلی دەیلەمی وەك دیاری بۆ ئەمیر دەنێرێت نەك گۆزە. حسەین کوڕی عەلی سەری داخست و ئەمیر لەقسەکەی ئەو سەری سوڕما.؟

## بەسەرهاتەکانی میسر و مەهدی عەلەوی

لەم ساڵەدا باوکی محەممەد عوبەیداللەی عەلەوی بەنازناوی مەهدی سوپایەکی بەسەرکردایەتی حوباسە لەئەفریقییەوە بۆ ئەسکەندەرییە ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە دەستی بەسەر ئەسکەندەرییەدا گرت.

ئەم سوپایە دەریای بڕی و لەوێوە بەرەو میسر ملی ڕێگەی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە نێوان میسر و ئەسکەندەرییە، موقتەدر لەم هێرشە ئاگادار بوویەوە و مونسی خزمەتکاری لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی حوباسە بەرەو میسر نارد و بەکەرەستە و توێشوو هاوکاری دەکرد.

مونس بەرەو میسر بەڕێکەوت. دوو سوپا لەجومادی الاوەل/ نۆڤەمبەر ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورس دەستیپێکرد و ژمارەیەکی فراوان لەهەردوو لا کوژران و بەم ئەندازەیە بریندار لەسەر زەوی کەوت. ڕۆژی دواتر شەڕێکی مەترسیدارتر و خوێناویتر هەڵگیرسا و جاری سێیەم و چوارەمیش تا ئەوەی سەرئەنجام هاوەڵانی عەلەوی شکستیان خوارد، یا کوژران یا ئەسیر کران. ژمارەی کوژراو و ئەسیرەکان دەگەیشتە حەوت هەزار کەس. پاشماوەکان هەڵاتن.

ئەم ڕووداوە لەکۆتاییەکانی جومادی الاخرە/ بیست و دووی ژانویە ڕوویدا و دەرئەنجامەکەی عەلەوییەکان بۆ ڕۆژئاوا گەڕانەوە و کاتێك گەیشتن، مەهدی، حوباسە، فەرماندەی سوپاکەی کوشت.

لەم ساڵەدا عروبە کوڕی یوسفی کوتامی لەقیروان دژی مەهدی شۆڕشی کرد و ژمارەیەکی زۆر لەکوتامییەکان و بەربەرییەکان پەیوەستی بوون. مەهدی مواليیەکەی، غالبی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد و جەنگی مەترسیدار لەنزیك قیروان هەڵگیرسا. عروبە وکوڕە مامەکانی کوژران و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی کوشتار کران کە لەژماردن نایەت. سەری فەرماندەکانی ئەوانیان کردە ناوە سەوەتەیەك و بردیانە لای مەهدی. وتی: چەندە سەیرە ئەم جیهانە! سەری ئەم دەستەیە لەناو سەوەتەیەك جێگەی دەبێتەوە لەکاتێکدا پانتایی مەغریب جێگەی سوپاکەی ئەوان نەدەبوویەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بیشری خزمەتکار، فەرمانڕەوای تەرسوس، لەگەڵ ڕۆمییەکان جەنگی و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد و تالآنیی زۆری بەدەست هێنا. ئەو لەم جەنگەدا سەد و پەنجا بەتریق و سوپاسالاری ئەسیر کرد لەگەڵ دوو هەزار سەرباز.

لەم ساڵەدا مونسی خزمەتکار لەوادی ئەلزەئاب لەگەڵ عەرەبە دەشتەکییەکانی منالەکانی شەیبان جەنگی و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و ماڵەکانی تالآن کرد و لەسامانی ئەو بازرگانانەی لەرێگەی دزییەوە، داراییان پاشکەوت کردبوو، بەئەندازەیەك تالآنی دەستکەوت کە لەخەملآندن نایەت.

لەزیحەججە، جونی ئەم ساڵە بیدعەی گۆرانیبێژ، موالی عورەیب کەخۆی موالی مەئمون بوو، مرد. (ئەو کەنیزە سامان و زێر و خشڵی گرانبایی زۆری بوو کەموقتەدر هەمووی خوارد).

لەزیحەججە/ جونی ئەم ساڵە، عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر کاروانی حاجییەکان و رێگەکانیان بڕی و ئەوەی لەوشتر و سامان و کەل و پەل دەیانویست، دزییان و دووسەد و پەنجا ژنیان ئەسیر کرد.

فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیك ریٚ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان فەرمانڕەوایەتی موسڵی پێبڕا.

لەم ساڵەدا شا کوڕی میکال مرد.

لەشەوی جەژنی قوربانی ئەم ساڵە، سێ ئەستێرەی گەورە (بەردی ئاسمانی) کەوتەخوار. دوو ئەستێرە لەسەرەتای شەو و یەکیان لەکۆتاییەکانی شەو. لەم شێوەدا بارینی ئەستێرە بچووکەکان دەبینرا.

تا کۆتایی ئەم ساڵە مێژووی ئەبو جەعفەری تەبەری بەکۆتایی دەگات. من بەشێك لەنوسخەکانی تەبەریم تا ساڵی سێسەد و سێ بینیوە کەدەستەیەك باوەڕیان وایە ئەم دوایین ساڵەی پێ زیاد کراوە و نابێت وەك مێژووی تەبەری هەژمار بکرێت و خواوەند زاناترە.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی باوکی حەسانی ئەنماتی و ئیبراهیم کوڕی شەریك و باوکی عیسا کوڕی قەزاز و باوکی عەباسی بەرانی و عەلی کوڕی محەممەد کوڕی نەسر کوڕی بەسامی وتاردەر – کەحەفتا و چەند ساڵ ژیا– کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سێی کۆچی ( ٩١٦ زایینی )

## چۆنیەتی کاری حسەین کوڕی حەمدان

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی حەمدان لەجەزیرە (لەنێوان دیجلە و فورات) دژی موقتەدر ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە.

پاڵنەرەکەی ئەوە بوو عەلی کوڕی عیسای وەزیر، داوای ماڵیاتی سەرزەمینی ڕەبیعەی لێکرد و حسەین لەدانی ماڵیات، کەمتەرخەمی لەخۆی نیشاندا. عەلی کوڕی عیسا فەرمانی پێدا ئەم کەنارە بەکارگوزارەکانی خەلیفە بسپێرێت بەڵام حسەین رازی نەبوو.

چوونکە مونسی خزمەتکار بۆ جەنگی مەهدی عەلەوی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، لەمیسر بوو، وەزیر، رائیقی گەورەی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی حسەین کوڕی حەمدان ڕەوانە کرد و نامەیەکی بۆ مونس نووسی و فەرمانی پێدا دوای کۆتایی هاتن لەجەنگی عەلەوییەکان بۆ جەنگی حسەین بەرەو جەزیرە بڕوات. رائیق بۆ جەنگی حسەین بەرێکەوت.

حسەین نزیکەی بیست هەزار سواری کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر رائیق. ئەو گەیشتە حەبەشە و سوپاکەی رائیق لێی نزیك ببوویەوە. کاتێك سوپاکەی رائیق ژمارەی زۆری سەربازەکانی سوپاکەی حسەینی بینی، هەستی بەناتەوانی خۆی کرد چوونکە ژمارەی سوپاکەی لەچوار هەزارکەس تێپەڕی نەدەکرد. سوپاکەی رائیق رێگەی دیجلەی گرتەبەر و لەشوێنێك ئوردووی لێدا کەتەنیا یەك رێگەی هەبوو. حسەین گەیشت و گەمارۆی خستنەسەر و نەیهێشت خواردەمنییان پێ بگات. سوپاکەی رائیق لەکەمی ئالیك و توێشوو گرفتار بوو. سوپاکەی رائیق پەیامیان بۆ حسەین نارد تا دەست لەوان هەڵگرێت و لەبەرابەردا ئەوان داوا لەخەلیفە دەکەن وەك فەرمانڕەوای سنوورەکەی بیهێڵێتەوە بەڵام حسەین وەڵامی نەدانەوە. حسەین لەگەمارۆدانی ئەوان بەردەوام و شەڕ درێژەی کێشا تا ئەو کاتەی مونس لەشام گەڕایەوە. کاتێك سوپاکەی رائیق لەهاتنی سوپاکەی مونس

ئاگادار بوون، ورەیان بەرز بوویەوە و بەپێچەوانەوە سوپاکەی حسەین وەری لەدەستدا. سوپاکەی حسەین هێرشی کردە سەر سوپاکەی رائیق و هەوڵیدا سەرکوتیان بکات بەڵام شکستی خوارد و خۆی بۆ رەبیعە گەڕایەوە. سوپاکەی رائیق رێگەی موسڵی گرتەبەر.

مونس لەکارەکانی حسەین ئاگادار بوویەوە و بۆ گەیشتن بەو هەوڵیدا. ئەحمەد کوڕی کەیغلەغ هاورێیەتی ئەوی دەکرد. کاتێك لەحسەین نزیك بوویەوە، حسەین نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێبوردنی کرد. چەند پەیکێك لەنێوان ئەوان هاتوچۆی دەکرد بەڵام نەیانتوانی بەسازگاری بگەن. مونس هێرشی کردە سەر حسەین و لەبەرابەر دوورگەی کوڕی عومەر رووبەرووی بوویەوە. حسەین لەگەڵ باروبنە و منداڵەکانی خۆی بەرەو ئەرمەنستان بەرێکەوت. سوپاکەی بلاوەیان لێکرد و پەیوەستی مونس بوون.

مونس سوپایەکی بۆ شوێنکەوتنی حسەین ڕەوانە کرد. فەرماندەی ئەم سوپایە بولەیق بوو و سیمای جەزری و جونی سەفوانی لەناو ئەم سوپایەدا دەبینران. ئەوان تا تەل فافان (فاقان) شوێن حسەین کەوتن بەلام نەیانتوانی بیگرن. حسەین دانیشتوانی ئەم ناوچانەی کوشتبوو و سەرزەمینەکانی سوتاندبوو. سوپاکەی مونس بۆ گرتنی ئەو هەولەکانی خۆیان چڕ کردەوە و سەرئەنجام پێی گەیشتن. جەنگیان دەستپێکرد و هاوەلانی حسەین هەلاتن. ئەو لەگەڵ عەبدوەهالی کوڕی و ئەندامانی بنەماڵەکەی ئەسیر کرا و زەوییەکان دەستیان بەسەردا گیرا.

مونس لەگەڵ حسەین لەرێگەی موسڵەوە بۆ بەغداد گەڕایەوە. حسەین و کوڕەکەیان سوار وشترێك کرد و دوو کلاوی بۆقیان کردنەسەر و دوو لبادی درێژیان لەبەر کردن و جل و بەرگی دروست کراو لەپەشمی سوریان لەبەر کردن. حسەین و کوڕەکەی لای زەیدانی قەهرەمانە (خاتوونی پێشکاری کۆشك) زیندانی کران. موقتەدر، باوکی هەیجا کوڕی حەمدان و براکانی دیکەی ئەوی گرت و زیندانی کردن. یەکێك لەکوڕەکانی حسەین کوڕی حەمدان هەلات و سوپایەکی کۆکردەوە و رووی کردە ئامەد (دیاربەکر). فەرمانڕەوای ئامەد رووبەرووی بوویەوە و منالەکەی حسەینی کوشت و سەری ئەوی ڕەوانەی بەغداد کرد.

## بناغە داڕشتنی شاری مەهدییە

لەمساڵدا مەهدی خۆی بەرەو تونس و قەرتاجەنە(کارتاخنا) و شارەکانی دیکە بەڕێکەوت. دەیویست لەکەنار دەریا بناغەی شارێك داڕێژێت.

ئەو لەکتێبە ئەفسانەییەکاندا خوێندبوویەوە پیاوێك بەناوی باوکی زەید دژی فەرمانڕەوایەتییەکەی ئەو ئاڵای شۆڕش بەرز دەکاتەوە. لەبەر ئەمە ویستی شارێکی بەهێز و تۆکمە دروست بکات و بنەماڵە و سامانەکانی لەو شارەدا جێگیر و نیشتەجێ بکات. لەبەر ئەمە بناغەی شاری مەهدییەی داڕشت. ئەو هیچ شوێنێکی بەباشتر و بەهێزتر لەشوێنی شاری مەهدییە نەبینی. ئەم شوێنە دوورگەیەك بوو پەیوەست بەوشکانی، وەك بەری دەست کەپەیوەستی مەچەکی دەستە. ئەو بناغەی ئەم شارەی داڕشت و کردییە شوێنی مانەوەی خۆی. دیوارێکی بەهێزی بۆ دروست کرد و چەندین دەروازەی گەورەی لەناو دیوارەکەدا جێگیر کرد کەکێشی هەر تای دەرگایەك سەد قینتار[°] بوو.

سەرتای دروست کردنی ئەم شارە، ڕۆژی شەممە پێنجی زیقەعدەی ٣٠٣/دوانزەی مەی ٩١٦ زایینی بوو. کاتێك دیوارەکەی بەرز کرایەوە، مەهدی فەرمانیدا تیرهاوێژێك بڕواتە سەر دیوارەکە و تیرێك بەرەو ڕۆژئاوا بهاوێت. ئەم تیرە لەشوێنێك دابەزی کەبە موسەڵا ناوی برد. مەهدی وتی: سواری کەر دەگاتە ئەو شوێنە. مەبەستی ئەو لەکەرسوار باوکی یەزیدی خارجی بوو چوونکە ئەو سواری کەر دەبوو.

ئەو فەرمانی بەپیشەگەراندا کاری خۆیان دەستپێبکەن. دواتر فەرمانیدا شوێنێکی پیشەسازی لەناو دڵی کێوەکەدا دروست بکەن و بەدەرگایەك بەستی. سیلۆیەکی بۆ خواردەمەنی و هەمارێکی ئاوی دروست کرد. چەندین کۆشك و ماڵی تیا دروست کرد و کاتێك لەم کارە تەواو بوو، وتی: لەمڕۆوە ژنە ژنەکانی

---

[°]- کێشێك بەرابەر بەهەزار و دووسەد ئەوقیە و هەر ئەوقیە ٧/٥ میسقاڵە و ئەگەر هەر مسقاڵێك ٤/٤٦ گرەم بێت، کێشی هەر تای دەرگایەك ٤١٧٦ کیلۆ دەبێت. (وەرگێڕ)

فاتیمی(کچەکانی فاتیمە) – کەهەمان بنەماڵەی خۆی بوون– ئاسوودە بوون. دواتر لەوێ ڕۆشت.

کاتێك مەهدی سەرسوڕمانی خەڵکی لەتۆکمەیی و بەهێزی شارەکەی بینی، وتی: ئەمە هەمووی تەنیا بۆ یەك کاژێرە، بەو شێوە بوو چوونکە باوکی زەید نەیتوانی لەشوێنی کەوتنی تیرەکە بێتە پێش و دوای کاژێرێك بێ هیچ سەرکەوتنێك گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر سنوورە ئاوییەکان و مەبەستی قەڵای مەنسوریان کرد. هەرکەس لەناو ئەم قەڵایەدا بوو، گرفتار و بەڵایەکی گەورە بەرۆکی خەڵکانی گرت. سوپا سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ حسەین کوڕی حەمدان بوو. (نەیانتوانی ڕێگە لەهێرشی ڕۆمییەکان بگرن.)

لەم ساڵەدا حاجییەکان لەماڵی خواوەند گەڕانەوە. ئەوان لەم ساڵەدا بەهۆی تینویەتی و ترس، گرفتاری ڕەنجی فراوان بوون چوونکە دەستەیەك لەعەرەبەکان لەسەعلەبییە هێرشیان کردە سەر باوکی حامید و ڕەقا کوڕی محەممەد کەپاسەوانی ڕێگە بوو. باوکی حامید ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ژمارەیەکی کوشت و ئەوانی دیکەی ئەسیر کرد و ڕەوانەی بەغدادی کردن. موقتەدر فەرمانیدا ئەوان بەفەرماندەی پاسەوانەکان بسپێرن تا زیندانییان بکات. لەرێگە خەڵك پەلاماری ئەسیرەکانیاندا و ئەوانیان کوشت و جەنازەکانیان فڕدایە ناو دیجلە.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەجامیدە کەخۆی بەعەلەوی دەزانی، دەرکەوت و فەرمانڕەوای ئەو ناوچەی کوشت. هەموو شتێکی تالآن کردن و بڕێکی زۆر سامانی لەگەنجینەی باج فڕاند بەڵام ماوەیەك دواتر کوژرا و دەستەیەك لەهاوەڵانی کوژران و ژمارەیەکیان ئەسیرکران.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان بەفەرماندەیی غەسیت هێرشیان کردە سەر دەستەیەك لەجەنگاوەرانی تەرسوس و نزیکەی شەشسەد سواریان کوشت. موسوڵمانان لەم

ساڵەدا جەنگی هاوینەیان ئەنجام نەدا.

لەم ساڵەدا مەلیحی ئەرمەنی هێرشی کردە سەر مەرعەش و خراپەکاری کردە پیشە و دەستەیەك لەخەڵکانی ئەسیر کرد و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا ئاگرکەوتنەوە لەچەند ناوچەیەکی بەغداد روویدا و ژمارەیەك سووتان.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدولرەحمان ئەحمەد کوڕی شوعەیبی نەسائی، نوسەری کتێبی (سنن) لەمەککە کۆچی دوایی کرد و لەنێوان سەفا و مەروە بەخاك سپێردرا. حەسەن کوڕی سوفیانی نەسوری لەگەڵ ئەو مرد.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەینونە لەنەسیبین مرد. کۆکردنەوەی باج و بەڕێوبەردنی کاروباری زەوییەکانی سەرزەمینی رەبیعە لەئەستۆی ئەودا بوو. کاتێك مرد، کوڕەکەی جێگەی گرتەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عەلی محەممەد کوڕی عەبدوەهابی جەبائی موعتەزلی، مرد.

لەم ساڵەدا یەموت کوڕی مەزرەعی عەبدی، خوشکەزای جاحز، لەدیمەشق مرد.

لەم ساڵەدا فەزڵ کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چوار کۆچی ( ٩١٧ زایینی )

### لابردنی کوڕی وەهسوزان لەئیسفەهان

لەموحەڕەم/ جولای ئەم ساڵە عەلی کوڕی وەهسوزان سەرکردەی جەنگی ئیسفەهان، کۆیلەیەك کەپەروەردەی کردبوو و وەك منالی خۆی هەڵیگرتبوویەوە، بۆ کارێك بۆ لای ئەحمەد کوڕی شا، سەرپەرەستی گەنجینەی خەلیفەی ڕەوانە کرد. ئەم کۆیلە بێ ئەوەی لەئەسپەکەی دابەزێت، نیازی گەورەی خۆی بەئەحمەد وت و دەنگی خۆی بەرز کردەوە. ئەحمەد جوێنی پێدا و وتی: ئەی بەکرێگیراو! لەسەر ڕێگە بەم شێوەیە قسە لەگەڵ من دەکەیت؟ بەتوندی وەڵامی دایەوە. کۆیلە، چاوبەگریان بۆ لای سەروەرەکەی گەڕایەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد. عەلی پێی وت: ئەحمەد ڕاستی وت چوونکە ئەگەر بەکرێگیراو نەدەبوویت، دەتکوشت. کۆیلە گەڕایەوە و ئەحمەدی سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی کوشت. خەلیفە ئەم کارەی پەسەند نەکرد و عەلی کوڕی وەهسوزانی لەئیسفەهان لابرد و ئەحمەد کوڕی مەسروری بەڵخی لەجێگەی ئەو دانا. عەلی کوڕی وەهسوزان ڕێگەی کوێستانی گرتەبەر.

### وەزارەتی دووبارەی کوڕی فورات و لابردنی عەلی کوڕی عیسا

لەزیحەججە/ مەی ئەم ساڵە عەلی کوڕی عیسا لەوەزارەت دوورخرایەوە و باوکی حەسەن عەلی کوڕی فورات دووبارە ئەو پێگەی بەدەست هێنایەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: باوکی حەسەن کوڕی فورات لەزینداندا بوو. موقتەدر لەزیندان راوێژی پێدەکرد و گرنگی بەوتەکانی دەدا. ئەمە لەکاتێکدا عەلی کوڕی عیسا کاروباری وەزارەتی بەرێوەدەبرد و گرنگی بەوتەکانی کوڕی فورات و هاوەڵانی ئەو نەدەدا. عەلی کوڕی عیسا پیاوێکی چاك وکەمتر خراپەی لەگەڵ کەسەکان دەکرد. ڕۆژێك ئاگادار بوویەوە دەستەیەك لەهاوەڵانی حەسەن

کوڕی فورات، باسی گەڕاندنەوەی ئەو بۆ وەزارەت دەکەن. ئەو پەلەی کرد و داوای بەخشین و دوورخستنەوەی خۆی لەوەزارەت کرد و لەمبارەوە پرسیاری لەموقتەدر کرد. موقتەدر ئەم وتانەی بەناڕاست زانی و ڕێگەی نەدا دەست لەکارەکەی بکێشێتەوە و بەم شێوەیە عەلی کوڕی عیسا ئارام بوویەوە.

لەکۆتایی زیقەعدە/ بیست و شەشی مەی دایکی موسای پێشکار هاتە لای عەلی کوڕی عیسا تا نیازەکانی دەربار وکەسانی دەوروبەر بۆ جل و بەرگ و خەرجییەکانی دیکە بەوەزیر بڵێت. کاتێك گەیشتە کۆشك، عەلی کوڕی عیسا، خەوتبوو. پەردەدار پێی وت: عەلی کوڕی عیسا هەنووکە خەوتووە و من بوێری بێدار کردنی ئەوم نییە. دایکی موسا توڕە بوو و گەڕایەوە. عەلی کوڕی عیسا دەستبەجێ لەخەو هەستا و پەردەدار وکوڕەکەی بۆ لای دایکی موسا نارد و داوای لێبوردنی کرد بەڵام دایکی موسا ڕازی نەبوو و ڕۆشتە لای موقتەدر و لای خەلیفە و دایکی چەندین تۆمەتی بۆ عەلی کوڕی عیسا هەڵبەست. خەلیفە ئەوی لەوەزارەت لابرد و لەهەشتی زیقەعدە/ چواری مەی ئەوی گرت. بەم شێوەیە حەسەن کوڕی فورات بۆ وەزارەت گەڕایەوە و بەڵێنیدا ڕۆژانە هەزار و پێنسەد دینار بەگەنجینە بسپێرێت. ئەو هاوەڵانی عەلی کوڕی عیسا و خاقانی وەزیر و هاوەڵانی ئەوی قۆڵبەست کرد و شوێن هەموو کارگوزارەکان و کەسانی دیکە کەوت. حەسەن کوڕی فورات داوای سامانێکی زۆری لەوان دەکرد بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو بڕە پارەی بەڵێنیدابوو بەگەنجینەی بسپێرێت، دابین بکات.

عەلی کوڕی عیسا باجی ئەو ساڵەی زووتر لەکاتی خۆی داوا کردبوو بۆ ئەوەی لەجەژندا خەرجی بکات. ئەم پارەیە لەکاتی وەزارەتی حەسەن کوڕی فورات گەیشت و بووە هۆی ئاسانکاری بۆ وەزیری تازە.

عەلی کوڕی عیسا، نامەی بۆ کارگوزارەکانی فارس، ئەهواز، کێوەکان و شوێنەکانی دیکە نووسیبوو و پێداگری کردبوو تا لەزووترین کاتدا باج ڕەوانە بکەن. هەمووماڵیاتەکان دوای هاتنە سەرکاری حەسەن کوڕی فورات گەیشتنە بەغداد. بەم شێوەیە کوڕی فورات بەکۆکردنەوەی ئەم پارانە بانگەشەی شیاوی خۆی بۆ بردنەسەری بەڵێن و پەیمانەکەی دەکرد.

باوکی عەلی کوڕی موقلە لەکاتی زیندانی کرانی حەسەن کوڕی فورات خۆی شاردبوویەوە. کاتێك کوڕی فورات دووبارە وەزارەتی گرتەدەست، خۆی ئاشکرا کرد و کوڕی فورات ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە.

## چۆنیەتی بەسەرهاتی یوسف کوڕی باوکی ساج

یوسف کوڕی باوکی ساج لەئازەربایەجان و ئەرمەنستان لەدەورانی یەکەمی وەزارەتی کوڕی فورات، کاروباری جەنگ، خوێندنی نوێژ، ئەنجامدانی فەرمان و حوکمەکانی لەئەستۆدا بوو. ئەو دەبوا هەموو ساڵێك برێك پارە بەدیوانی خەلافەت بدات بەڵام کاتێك کوڕی فورات لەسەر کار لابرا و خاقانی و دوای ئەو عەلی کوڕی عیسا هاتنە سەرکار، گوڵی تەماحی یوسف شکۆفەی کرد و لەناردنی باج کەمتەرخەمی نیشان دەدا. بەم شێوەیە پارەیەکی زۆری کۆکردەوە و توانای شۆڕش کردنی لەخۆیدا بینی و تا ئەم ساڵە ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە بەردەوام بوو. کاتێك عەلی کوڕی عیسا قۆڵبەست کرا، یوسف بانگەشەی ئەوی کرد کەخەلیفە ئەوی وەك فەرمانڕەوای شاری ڕەی دەستنیشان کردووە و عەلی کوڕی عیسا ئەم فەرمانەی بۆ ناردووە. سوپایەکی کۆکردەوە و مەبەستی گرتنی شاری ڕەی کرد. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی عەلی سەعلوك فەرمانڕەوای ڕەی بەنوێنەرایەتی نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی، فەرمانڕەوای خوراسان بوو. سەعلوك لەرۆژگاری وەزارەتی عەلی کوڕی عیسا، دەستی بەسەر شاری ڕەی و ناوچەکانی دەوروبەری گرتبوو. ئەو بەڵێنی بەسەرپەرەستەکانی دیوانی خەلافەت دابوو باجی ئەو دیارە کۆبکاتەوە و ڕەوانەی بکات بەڵام کاتێك لەهێرشەکەی یوسف کوڕی باوکی ساج ئاگادار بوویەوە، بەرەو خوراسان هەڵات. یوسف ڕۆشتە ناو شارەکە و دەستی بەسەر ڕەی، قەزوێن، زەنجان و ئەبهەردا گرت. کاتێك موقتەدر لەهێرشەکەی یوسف و ئەوەی عەلی کوڕی عیسا ئاڵای فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەی بۆ ناردووە، تووڕە بوو و ئەم کارەی پەسەند نەکرد.

یوسف نامەیەکی بۆ کوڕی فوراتی وەزیر نووسی کەعەلی کوڕی عیسا فەرمانڕەوایەتی ئەم سەرزەمینانەی بەو سپاردووە. هەروەها نووسی دەستی

بەسەر شارەکاندا گرتووە وئەو کەسانەی پێشتر لەو ناوچانە فەرمانڕەوایەتییان دەکرد، دەرپەڕاندووە. ئەو بۆ کارەکەی خۆی داوای بەخشینی کرد و فراوانی خەرجییەکانی خۆی وەك پاساو هێنایەوە. موقتەدر بەمە رازی نەبوو و فەرمانی بەکوڕی فوراتدا سەبارەت بەقسەکانی یوسف لەعەلی کوڕی عیسا پرسیار بکات. کوڕی فورات عیسای بانگ کرد و پرسیاری لێکرد. عەلی کوڕی عیسا حاشای لەو قسانە کرد و وتی: لەدەبیرەکان وکەسانی نزیکی خەلیفە بپرسن. چوونکە ئەگەر ئالآیەك لەئارادا بووبێت بەناچاری دەبێت بەشێك لەخزمەتکارەکانی خەلیفە یا دەستەیەك لەسەرکردەکان لێی ئاگادار بن. ئەوان هەستیان بەراستی وتەکانی عەلی کوڕی عیسا کرد.

کوڕی فورات نامەیەکی بۆ کوڕی باوکی ساج نووسی و وتەکانی ئەو و هەڵبەستی تۆمەت بۆ عەلی کوڕی عیسای بەدرۆ لەقەڵەمدا. ئەو سوپایەکی بۆ جەنگ لەگەڵ یوسف کوڕی باوکی ساج ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەساڵی ٩١٨/٣٠٥ زایینی ڕەوانە کرا.

فەرماندەی ئەم سوپایە، خاقانی موفلحی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرکردەکان وەك ئەحمەد کوڕی مەسروری بەڵخی، سیمای جەزری و نەحریری بچوك بوون. ئەم سوپایە بەرێکەوت و رووبەرووی سوپاکەی یوسف بوویەوە. جەنگیان دەستپێکرد. یوسف شکستی پێهێنان و دەستەیەك لەوانی ئەسیر و بۆ ریسوا کردنیان ئەوانی سواری وشتر کرد و بردنیە ناو شاری ڕەی. خەلیفە، مونسی خزمەتکاری لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو نارد. مونس بەرێکەوت و سوپاکەی خاقانی شکست خواردوو پەیوەستی بوو. خاقان لەفەرمانڕەوایی سنووری کێوەکان دوورخرایەوە و نەحریری بچوك جێگەی گرتەوە.

کاتێك مونس بەرێکەوت، ئەحمەد کوڕی عەلی، برای محەممەد کوڕی عەلی سەعلوك، هاتە لای و داوای ئەمانی کرد. مونس ئەمانی پێبەخشی و رێزی گرت و خەڵاتی پێدا. کوڕی باوکی ساج نامەیەکی بۆ موقتەدر نووسی و خوازیاری رەزامەندی ئەو بوو. لەنامەکەیدا نووسیبووی باجی ڕەی و ناوچەکانی دەوروبەری ڕەوانە دەکات و جگە لەدابین کردنی نیازی سوپا و کەسانی دیکە، حەوتسەد

هەزار درهەم بەگەنجینە دەدات. موقتەدر رازی نەبوو و وتی: ئەگەر داهاتی هەموو زەویم پێبدات، رازی نابم و بۆ ماویەك یەك رۆژ ئەو ناکەمە فەرمانڕەوای ڕەی چوونکە ڕێگەی فرت و فێڵی گرتۆتەبەر. کاتێك کوڕی باوکی ساج ئەمەی زانی، شاری ڕەی بەجێهێشت و وێرانی کرد و لەماوەی دە رۆژ، باجی شارەکەی کۆکردەوە.

خەلیفە، فەرمانڕەوایەتی، ڕەی، قەزوێن و ئەبهەری بەوەسیفی بەکتەمەری سپارد. کوڕی باوکی ساج داوای کرد، سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو، بەخۆی بسپێردرێت و ئەو باجەکەی بدات. کوڕی فورات پێشنیاری کرد خەلیفە بەداواکەی رازی ببێت بەڵام نەسری پەردەدار و کوڕی حەواری رازی نەبوون و وتیان: نابێت بەداوکارییەکەی رازی بن مەگەر ئەوەی لەبارەگای خەلیفە سەری ملکەچ بوون دانەوێنێت.

لەم ناوەدا کوڕی فورات، بەلایەنگیری و هاورێیەتی کوڕی باوکی ساج تۆمەتبار کرا و بەمشێوەیە لەنێوان نەسری پەردەدار و کوڕی حەواری لەگەڵ کوڕی فورات دوژمنایەتی هاتە ئاراوە. موقتەدر بەداواکەی کوڕی باوکی ساج رازی نەبوو مەگەر ئەوەی لەبارەگاکەی سەری ملکەچ بوون دانەوێنێت. کاتێك کوڕی باوکی ساج هەستی بەوە کرد ئەگەر بڕواتە بارەگای خەلیفە، گیانی لەمەترسیدایە، ڕووبەڕووی مونس بوویەوە و مونس بۆ زەنجان هەڵات و لەسەرکردەکانی ئەو، سیما کوڕی بویە کوژرا و دەستەیەك وەك هیلال کوڕی بەدر ئەسیر کران. ئەو بۆ ریسوایی ئەوانی سوار وشتر بردە ناو شاری ئەردەبیل.

مونس لەزەنجان سەرقاڵی کۆکردنەوەی سوپا بوو. داوای هاوکاری لەخەلیفە کرد. کوڕی باوکی ساج نامەیەکی بۆ نووسی و باسی ئاشتی هێنایە ئاراوە. ئەم دوانە نامەیان بۆ یەك نووسی و مونس خەلیفەی ئاگادار کردەوە بەڵام خەلیفە رازی نەبوو. لەموحەرەمی ٣٠٧/٩١٩ زایینی، سوپایەکی گەورە لەدەوری مونس کۆبوویەوە. لەم کاتەدا حامید کوڕی عەباس وەزیر بوو. مونس بۆ جەنگی یوسف بەرێکەوت و دوو سوپا لەکەنار دەروازەی ئەردەبیل ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. سوپاکەی یوسف شکستی خوارد و یوسف و ژمارەیەك لەهاوەڵانی دیل کران.

مونس ئەوانی هێنایە بەغداد و لەموحەرەم/ جولای ئەوانی گەیاندە شارەکە. بۆ ریسوا کردنی ئەویان سواری وشتر کرد و کلاوێکی بۆقیان کردەسەر کەکلکی کەمتیاری پێوە هەڵواسرابوو. بەم شێوەیە ئەویان بردە بارەگای موقتەدر. ئەو لەکۆشکی خەلیفە لای زەیدانی قەهرمانە زیندانی کرا.

کاتێك مونس سەرکەوتنی بەسەر یوسف بەدەست هێنا، سنورەکانی ڕەی، دەماوەند، قەزوێن، ئەبهەر و زەنجانی بەعەلی کوڕی وەهسوازن سپارد و سامانەکانی بۆ خەڵکان گەڕاندەوە و ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی سەعلوکی وەك فەرمانڕەوای ئیسفەهان، قوم، کاشان و ساوە دەستنیشان کرد و خۆی ماڵئاوایی لەئازەربایەجان کرد.

## بارودۆخی ئەم سەرزەمینانە دوای ڕۆشتنی مونس

کاتێك مونس لەئازەربایەجانەوە ڕێگەی عێراقی گرتەبەر، سوبوك، کۆیلەی یوسف کوڕی باوکی ساج، هێرشی کردە سەر ئازەربایەجان و دەستی بەسەردا گرت. سوپایەکی گەورە لەدەوری کۆبوویەوە. مونس، محەممەد کوڕی عوبەیداللەی فارقی بۆ جەنگی سوبوك ڕەوانە کرد و ئازەربایەجانی خستە ژێر فەرمانی ئەو. فارقی ڕووبەڕووی سوبوك بوویەوە بەڵام شکستی خوارد و بۆ بەغداد گەڕایەوە. سوبوك ئازەربایەجانی گرت و دواتر نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی تا ئازەربایەجان بەو بسپێرێت و باجی لێ وەربگرێت. خەلیفە بەداواکەی رازی بوو و ساڵانە دانانی دووسەد و بیست هەزار دینار کەوتە سەر شانی سوبوك. خەلیفە فەرمان و خەڵاتی بۆ نارد بەڵام سوبوك ڕێزی لەپەیمانەکەی خۆی نەگرت.

ئەحمەد کوڕی موسافر، فەرمانڕەوای تورەم، دژی عەلی کوڕی وەهسوازنی برازای خۆی، کە لەقەزوێن مابوویەوە، شۆڕشی کرد و ئەوی لەجێگەکەیدا کوشت و بۆ تورەم هەڵات. وەسیفی بەکتەمەری لەجیاتی عەلی کوڕی وەهسوزان فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەی گرتەدەست و محەممەد کوڕی سلێمان، وەك فەرماندەی سوپا و لێپرسراوی کۆکردنەوەی باج راسپێردرا.

ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی سەعلوك لەشاری قومەوە ڕێگەی ڕەی گرتەبەر و

دەستی بەسەردا گرت. خەلیفە بەم کارە رازی نەبوو. فەرمانی پێدا بۆ قوم بگەڕێتەوە و ئەو گەڕایەوە بەڵام دووبارە رێگەی ناسازگاری گرتەبەر و لێپرسراوانی کۆکردنەوەی باجی لەشارەکە دەکرد و خۆی بۆ گرتنی ڕەی ملی رێگەی گرتەبەر. لەم کاتەدا نامەی بۆ نەحریری بچوك فەرمانڕەوای هەمەدان ڕەوانە کرا تا لەگەڵ وەسیف بەرەو ڕەی بەرێکەون و رێگە نەدەن ئەحمەد کوڕی عەلی دەستی بەسەردا بگرێت. ئەوان بەرەو شاری ڕەی بەرێکەوتن و ئەحمەد کوڕی عەلی لەدەروازەی رەی رووبەروویان بوویەوە و شکستی پێهێنان. محەممەد کوڕی سلێمان کوژرا و ئەحمەد، ڕەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. نامەیەکی بۆ نەسری پەردەدار نووسی تا لەنێوان ئەو و خەلیفە نێوەنجیگەری بکات. نەسر ئەو کارەی کرد و ڕەی، دەماوەند، قەزوێن، زەنجان و ئەبهەریان خستە ژێر فەرمانی ئەو بەو مەرجەی ساڵانە سەد و شەست هەزار دینار بۆ بەغداد ڕەوانە بکات. ئەحمەد قومی بەجێهێشت و خەلیفە کەسێکی بۆ فەرمانرەوایەتی ئەو شارە ڕەوانە کرد.

## زاڵبوونی کەسیر کوڕی ئەحمەد لەسیستان و جەنگی ئەو

کەسیر کوڕی ئەحمەد کوڕی شەهفور دەستی بەسەر سیستاندا گرت. خەلیفە نامەیەکی بۆ بەدر کوڕی عەبدوڵلەی حومامی فەرمانڕەوای فارس نووسی و فەرمانی پێدا سوپایەك بۆ جەنگی کەسیر ڕەوانە بکات و دەردا وەك فەرماندەی ئەم سوپایە دیاری بکات. بەدر سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و بۆ جەنگی کەسیر ڕەوانەی کرد. ئەم سوپایە خۆی گەیاندە کەسیر. کەسیر نەیتوانی بەرگری بکات و بەرادەیەك لاواز بوو ئەوەندەی نەما بوو، دەردا دەست بەسەر سیستاندا بگرێت. دانیشتوانی سیستان ئاگادار بوونەوە کەزەید زنجیری لەگەڵ خۆی هێناوە تا گەورەکانی ببەستێتەوە. هەموویان لەترسی سوپای خەلیفە پەیوەستی کەسیر بوون و پشتیوانییان لێکرد و شان بەشانی ئەو جەنگان و شکستیان بەسوپای خەلیفە هێنا و زەیدیان ئەسیر کرد و بەزنجیر ئەویان بەستەوە.

کەسیر نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و تاوانی ئەم کارەی لەسەر شانی خۆی لابرد و دانیشتوانی تۆمەتبار کرد. خەلیفە پەیکی بۆ لای بەدری حومامی نارد تا

خۆی بۆ جەنگی کەسیر بەرێکەوێت. بەدر سوپای رازاندەوە و کاتێك کەسیر ئاگادار بوویەوە، ترسا و نوێنەرێکی بۆ لای خەلیفە نارد و داوای کرد ئەو سەرزەمینە بەو بسپێرێت و سالأنە باجەکەی وەربگرێت. خەلیفە رازی بوو و پەیمانیان بەست سالأنە پێنسەد هەزار درهەم بۆ گەنجینە ڕەوانە بکات و ئەم سەرزەمینە لەژێر فەرمانی ئەودا بێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەهاوینی ئەم ساڵەدا خەڵکانی بەغداد لەئاژەڵێك ترسان بەناوی زەبزەب. ئەوان دەیانوت ئەم ئاژەڵە شەوانە لەسەر بانیماڵەکانیان بەرێگەدا دەڕوات و مناڵەکان دەخوات. ئەو دەستی پیاوێك و مەمکی ژنێکی لێکردەوە و لەگەڵ خۆی بردی. هاواری خەڵکان بەرز بوویەوە و پاسەوانیان لەماڵەکانی خۆیان دەکرد. بۆ ترساندنی ئەم ئاژەڵە لەتەشت و دەفرەکانیان دەکوتا بەشێوەیەك شەوانە بەغداد دەلەرییەوە. تا ئەوەی پاسەوانەکانی خەلیفە شەوێك ئاژەڵێکیان ڕاو گرت ڕەش و سپی کەدوو دەست و دوو قاچی کورتی بوو، وتیان: ئەمە هەمان زەبزەبە[٦]. ئەویان لای پردەکە کوشت و خەڵکان ئاسوودە بوون. ئەم ئاژەڵە بەتەبرەیش ناو دەبەن. لەم بگرە و بێنەدا دزەکان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون چوونکە خەڵکان لەوان بیْ ئاگا بوون.

لەشەعبان/ ژانویەی ئەم ساڵە ناسری عەلەوی، فەرمانڕەوای تەبەرستان لەتەمەنی حەفتا و نۆساڵیدا مرد. تەبەرستان هێشتا لەژێر دەسەلأتی عەلەوییەکاندا بوو تا ئەوەی داعی کوژرا. داعی هەمان حەسەن کوڕی قاسمە کە لەساڵی ٩٢٨/٣١٦ زایینی – ئامارەی پێدەدەین– کوژرا.

لەم ساڵەدا باوکی یەزید خالید کوڕی محەممەدی مادەرائی لەکرمان دژی موقتەدر ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو لێپرسراوی کۆکردنەوەی باج بوو. لەکرمانەوە بەرەو شیراز ڕۆشت و مەبەستی دەست گرتن بەسەر ئەو شارەی کرد.

---

٦– لەژیانی ئاژەلأنی جاحز هاتووە: ئەم ئاژەڵە هاوشێوەی پشیلەیە و دەستی لەقاچەکانی کورتترە و پشتی ڕەشە. وەرگێر.

بەدری حومامی بۆ جەنگی ئەو هاتە گۆڕەپان و دوای جەنگ، خوێنی ڕشت و سەری بۆ بەغداد نارد. سەری ئەویان بەناو شاری بەغداد دەسوڕاندەوە.

لەم ساڵەدا مونسی موزەفەر بۆ جەنگی هاوینە بەرەو سەرزەمینی رۆم بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە موسڵ. دووبارە بودا و قەردی بەسوبوك و شاری بەڵەد، باعیناسا و شەنگالی بەعوسمانی عەنزی و شارەکانی دیکەی رەبیعەی بەوەسیفی بوکتەمەری سپارد. مونس ڕۆشتە مەڵتییە و لەوێ جەنگی. ئەو نامەیەکی بۆ باوکی قاسم عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی بێستام نووسی و داوای لێکرد لەتەرسوس بۆ جەنگی رۆمییەکان ئەسپ غاربدات. باوکی قاسم ئەو کارەی کرد.

مونس دەستی بەسەر چەندین قەڵای رۆمییەکاندا گرت و چەندین شوێنەواری چاکی لەخۆی بەجێهێشت (ئەگەری هەیە ژمارەیەکی زۆرتری کوشتبێت و تاڵانی زۆرتری کۆکردبێتەوە. وەرگێڕ) سنورنشینەکان سەرکۆنەیان کرد و وتیان: ئەگەر دەیویست، زیاتر لەوەی کردوویەتی، دەیکرد. مونس بۆ بەغداد گەڕایەوە و خەلیفە ڕێزی گرت و خەلاتی پێبەخشی.

لەم ساڵەدا یەموت کوڕی مەزرەعی عەبدی، خوشکەزای حاحز، و سلێمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەحمەد باوکی موسای نەحوی کەزانست لەسەعلەبەوە فێر ببوو، مردن. سلێمان لەزیحەجچە/ مەی لەحامز مرد. ئەو لەهاوەڵانی سەعلەب و یوسف کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی یەعقوبی رازی بوو. یوسف لەهاوەڵانی زوئەلنونی میسریە کەبەسەرهاتی مشك بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

(ئەم داستانە بەم شێوەیە کەیوسف دەڵێت: بیستبووم زوئەلنونی میسری لەگەورەترین ناو ئاگادارە. ماوەیەك لەگەڵ ئەودا بووم و داوام لێدەکرد ناوی گەورەیش بەمن بڵێت تا ئەوەی سەرئەنجام زوئەلنون تەبەقێکی دایە دەستم کەسەرەکەی داپۆشراو بوو. پێی وتم: ئەمەبۆ فلانەکەس ببە. لەرێگەدا بەخۆم وت باشترە بزانم چی تێدایە. سەرەکەیم لابرد و بینیم مشکێکی زیندووی تیا. مشکەکە دەستبەجێ هەڵات و من بێ هیوا بۆ لای زوئەلنون گەڕامەوە. بەمنی وت: هاوار لەتۆ، ئەو کەسەی نەتوانێت مشکێك راگرێت چۆن دەتوانێت پارێزگاری لەناوی گەورە بکات. برۆ تۆ شیاو نیت بۆ ئەوەی ئەو ناوە بزانێت.)

## ڕووداوەکانیساڵی سێسەد و پێنجی کۆچی ( ٩١٨ زایینی )

لەموحرەم/ جونی ئەم ساڵە دوو نێردراو لەلایەن پاشای ڕۆمەوە هاتنە لای موقتەدر و خوازیاری ئاشتی و ئاڵ و گۆڕی دیلەکان بوون. ڕێزیان لەم دوانە گرت و ئەوانیان بردە لای وەزیر. وەزیر بارودۆخێکی بەشکۆی بوو. سوپاییەکان بەکەرەستەی جەنگەوە و ئامادەیی تەواو بەریز وەستا بوون. ئەم دووانە پەیامەکەی خۆیان بەوەزیر گەیاند و دواتر هاتنە بارەگای موقتەدر. موقتەدر بۆ میوانداری ئەوان دانیشتبوو. سوپاییەکان بەهەمان شێوە ئامادە و شمشێر بەدەست بەریز وەستابوون. ئەو دوانە پەیامەکەی خۆیان گەیاند و موقتەدر بەداوای پاشای ڕۆم بۆ گۆڕینەوەی دیلەکان ڕازی بوو و مونسی خزمەتکاری بۆ ئەم مەبەستە ڕەوانە کرد. موقتەدر فەرمانیدا مونس ببێتە فەرمانڕەوای هەر شارێك کەدەڕواتە ناوی و تا کاتی ڕۆشتنەدەر لەو شارە، چی دەخوازێت، ئەنجامی بدات. موقتەدر دەستەیەك لەسوپاییەکانی لەگەڵ مونس نارد و ڕۆژانەیەکی بەرچاوی بۆ دیاریکردن. موقتەدر بۆ ئازاد کردنی دیلە موسوڵمانەکان سەد و بیست هەزار دیناری بەمونس دا. مونس لەگەڵ نێردراوی پاشای ڕۆم بەرێکەوت و ڕێ و ڕەسمی گۆڕینەوەی دیلەکان ئەنجامدرا. لەم ساڵەدا باوکی هەیجا کوڕی حەمدان و براکان و بنەماڵەکەی لەزیندان ئازاد کران. ئەوان لەکۆشکی خەلیفە زیندانی بوون. پێشتر ئاماژەمان بەچۆنیەتی زیندانی کرانی ئەواندا. لەم ساڵەدا عەباس کوڕی عەمرۆ غەنەوی کە لەسەرزەمینی میسر کاروباری جەنگی هەڵدەسوڕاند، مرد و وەسیفی بوکتەمەری جێگەی ئەوی گرتەوە بەلآم نەیتوانی کاروبارەکان ڕێکبخات و جونی سەفەوانی لەجێگەی ئەو دانرا و لەئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرکەوتوو بوو.

لەم ساڵەدا لەبەسرە شۆڕشێکی گەورە دەستپێکرد. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کەحەسەن کوڕی خەلیل کوڕی ڕەماڵ هەڵسوڕێنەری کاروباری جەنگی تایبەت بەبەسرە و چەندین ساڵی لەوێ بەسەر بردبوو. لەنێوان ئەو و خەڵکانی موزێر و ڕەبیعە چەندین جار جەنگ ڕوویدا و دواتر دەستیان لەجەنگ هەڵدەگرت تا ئەوەی

جەنگێکی درێژخایەن و بەردەوامیان دەستپێکرد و حەسەن نەیدەتوانی لەماڵەکەی خۆی لەرەحبەی مناڵەکانی نومەیر بێتەدەر. هەموو سوپاکەی لەدەوری کۆببوونەوە و ئەگەر سەربازێکیان لەرێگەدا دەبینی، خوێنیان دەڕشت تا ئەوەی گەمارۆیان خستە سەر ماڵەکەی و ئەو کانیاوەی ئاوی بەمناڵەکانی نومەیر دەگەیاند، کوێریان کردەوە. حەسەن بەناچاری ڕۆشتە مزگەوتی هەینی و ژمارەیەکی زۆری کوشت و چوونکە لەهێور کردنەوەی ئەوان ناتەوان بوو، لەگەڵ گەورەکانی بەسرە بەرەو واست بەرێکەوتن و بەم شێوەیە لەبەسرە دوورخرایەوە و باوکی دولَف هاشم کوڕی محەممەدی خوزاعی جێگەی ئەوی گرتەوە وبۆ ماوەی یەکساڵ مایەوە دواتر لەسەر کار لابرا و سوبوکی موفلیحی بەنوێنەرایەتی شەفیعی موقتەدری فەرمانڕەوایەتی بەسرەی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا سەمالی خزمەتکار بۆ جەنگی رۆمییەکان لەدەریای سپی ناوەڕاست وەك فەرماندە هەڵبژێردرا و بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا جونی سەفوانی لەگەڵ رۆمەکان جەنگی و تالأنی زۆری کۆکردەوە و سامانێکی زۆری تالأن کرد و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر و تەندروست و بێ زیان گەڕایەوە. لەم ساڵەدا باوکی خەلیفە حەدیس بێژی بەسری مرد. لەجومادی الاوەل/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە ئەبوجەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عوسمانی عەسکەری ناسراو بەسەمان (ڕۆن فرۆش) یا عومەری پێشەوای ئیمامییە مرد. دەوترا ئەو پەیوەندی لەگەڵ ئیمامی چاوەڕوانکراو (مەهدی) هەیە. ئەو پێش مردنی خۆی، باوکی قاسم کوڕی حسەین کوڕی روەحی وەك جێگر دەستنیشان کرد.

لەکۆتایی ئەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی شورەیح کە شارەزای ئایینی شافیعی بوو، مرد.

## ڕووداوەكانی ساڵی سێسەد و شەشی كۆچی ( ٩١٩ زایینی )

## لابردنی كوڕی فورات و وەزارەتی حامید كوڕی عەبباس

لەجومادی الاخرە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، باوكی حەسەن كوڕی فوراتی وەزیر دەستگیرا كرا. ڕۆژگاری وەزارەتی ئەو یەك ساڵ و پێنج مانگ و نۆزدە ڕۆژ درێژەی كێشا.

هۆكارەكەی ئەوە بوو ئەو لەدانی پارەی ڕۆژانەی سوارەكان كەمتەرخەمی كرد. ئەو بانگەشەی ئەوەی دەكرد كەدارایی بۆ جەنگ لەگەڵ كوڕی ساج خەرج كراوە و داهاتەكان بەهۆی زاڵبوونی یوسف كوڕی باوكی ساج بەسەر شاری ڕەی و دەوروبەری كەوتۆتە دەستی ئەو. لەبەر ئەمە سوپاییەكان شۆڕشیان كرد و ڕوویان كردە نوێژگە. كوڕی فورات داوای لەموقتەدر كرد لەگەنجینەی تایبەت دووسەد هەزار دینار بدات و ئەویش خۆی دووسەد هەزار دینار بەدەست بێنێت بۆ ئەوەی بتوانن مانگانەی سوپاكەیان بدەن. موقتەدر ئەمەی پەسەند نەكرد و پەیامی بۆ نارد: تۆ بەڵێنت داوە سوپاكە رازی دەكەیت و ڕۆژانە بڕێك پارە بە گەنجینە دەدەیت و هەنووكە دەبینم چاوی تەماحت بڕیوەتە گەنجینەی تایبەت. كوڕی فورات ئاماژەی بەكەمی داهاتەكان و ئەو سامانە كرد كەكوڕی باوكی ساج فڕاندبووی لەگەڵ خەرجییەكانی جەنگ. موقتەدر گوێی لەوتەكانی ئەو نەگرت و ئەم كارەی بەقێزەون لەقەڵەمدا.

دەستەیەك وتوویانە چۆنیەتی گرتنی كوڕی فورات بەم شێوە بوو: بەموقتەدر وترا: كوڕی فورات دەخوازێت حسەین كوڕی حەمدان بۆ جەنگ لەگەڵ كوڕی باوكی ساج ڕەوانە بكات و كاتێك ئەو بگاتە لای كوڕی باوكی ساج، هەموویان دژی تۆ شۆڕش بكەن وبۆ لابردنی تۆ هەوڵ بدەن. دوای ماوەیەك كوڕی فورات بەموقتەدری وت: دەمەوێت حسەین كوڕی حەمدان بۆ جەنگی كوڕی باوكی ساج ڕەوانە بكەم. موقتەدر دڵنیا بوو لەوەی پیلانێك لەئارادایە لەبەر ئەمە لەجومادی الاوەل/ ئۆكتۆبەر كوڕی حەمدانی كوشت و لەجومادی الاخرە/ نۆڤەمبەر، كوڕی

فوراتی قۆڵبەست کرد.

کوڕی فورات بیستبووی حامید پێش کاتی دیاریکراو باجی سەرزەمینەکانی دەوروبەری واست کۆدەکاتەوە و بەم شێوەیە سامانێکی زۆری کەڵەکە کردووە. نامەیەکی بۆ نووسی تا سامانە پاشەکەوت کراوەکان ڕەوانە بکات. حامید ترسا لەوەی کوڕی فورات دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت. لەبەر ئەمەیە نامەیەکی بۆ نەسر پەردەدار و نامەیەکی دیکەی بۆ دایکی موقتەدر نووسی و بەڵێنیدا ئەگەر ئەم دووانە سەبارەت بەوەزارەتی ئەو قسە لەگەڵ موقتەدر بکەن، بڕێك سامانی زۆریان دەست دەکەوێت. ئەم دوانە لای موقتەدر باسی بەخشندەیی و کەسانی زۆری دەوری حامیدیان کرد و وتیان چوارسەد کۆیلە کەسەرتاپێ جل و بەرگی جەنگیان پۆشیوە، لەخزمەت ئەودان. ئەم گفتوگۆیە کاتێك بوو موقتەدر چیتر کوڕی فوراتی خۆش نەدەویست. موقتەدر، حامیدی لەواستەوە بانگ کرد. ئەو هاتە بارەگای موقتەدر. موقتەدر، کوڕی فورات و موحسنی کوڕی و هاوەڵان و کەسە نزیکەکانی ئەوی گرت.

کاتێك حامید گەیشتە بەغداد، سێ ڕۆژ لەکۆشکی خەلیفە مایەوە و لەم ماوەدا لەگەڵ خەڵکان دەئاخاوت و پێدەکەنی و کاتی هاتنی ئەوان لەسەر پێ دەوەستا. بۆ کۆیلەکان و باوکی قاسم حەواری و کەسانی ناو کۆشك ئاشکرا بوو کەئەو شارەزای کاروباری وەزارەتە. ڕۆژێك پەردەدار پێی وت: گەورەم، وەزیر دەبێت بەشێوەیەکی تایبەت جل و بەرگ بپۆشێت و دانیشێت و کەسێکی بەشکۆ بێت. حامید وتی: دەتەوێت بڵێی بەدڵی خۆی جل و بەرگ نەپۆشێت و لەگەڵ هەموو کەسێك دانەنیشێت و کاتی هاتنی کەس لەشوێنەکەی هەڵنەستێت و لەگەڵ کەس گفتوگۆ نەکات؟ وەڵامی دایەوە: بەڵێ. حامید وتی: خواوەند ڕوخسارێکی کراوە و سرشتێکی بەخشندەی بەمن بەخشیوە. من کەسێك نیم بۆ بەدەست هێنانی وەزارەت ڕووی خۆم گرژ بکەم و سرشتی خۆم بگۆڕم. لای موقتەدر ڕەخنەیان لێگرت و بەناشارەزایی لەکاروباری وەزارەت تۆمەتباریان کرد. موقتەدر فەرمانیدا عەلی کوڕی عیسا لەزیندان ئازاد بکەن. دیوانەکانی بەو سپارد وەك بڵێی بوو بەنوێنەری حامید. لەسەرەتا بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان ڕاوێژی بەحامید دەکرد

بەڵام دواتر بێ ڕاوێژ کردن بەحامید کاروبارەکانی هەڵدەسوڕاند. حامید لەوەزارەت تەنیا ناوەکەی بۆ مابوو بەڵام کاروبارەکان لەسەر دەستی عەلی کوڕی عیسا ئەنجام دەدرا. تا ئەو جێگەی ئەم هۆنراوەیان هۆنییەوە:

هذا وزير بلا سواد          و ذا سواد بلا وزير

واتاکەی: ئەم وەزیرێکە بێ ئەوەی سنوری فەرمانڕەوایەتی هەبێت و کەسێکی دیکە هەموو سنورەکانی لەدەست دایە بێ ئەوەی وەزیر بێت.

دواتر حامید، کوڕی فوراتی بانگ کرد تا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکات. عەلی کوڕی ئەحمەدی مادەرائی (ماوەرائی، بۆ لێپرسینەوە لەو راسپارد تا پەردە لەسەر نهێنی کوڕی فورات هەڵگرێت بەڵام نەیتوانی ئەرکەکەی بەکۆتا بگەیێنێت. حامید خۆی ئەم کارەی گرتە ئەستۆ و جوێنی بەکوڕی فوراتدا و ئابڕوی ئەوی برد و هێرشی کردەسەر و بەمشتەکۆڵە لێیدا.

کوڕی فورات بەحامیدی نەزانی وت: تۆ هەنووکە لەسەر فەرشی خەلیفە و لەکۆشکی خەلافەتیت. ئێرە سەر خەرمان نییە تا بزانیت چۆن دابەشی دەکەیت و گەنم و جۆ لەئارادا نییە تا لەپێوانە کردن زێدەڕۆیی بکەیت و جووتیارێك لێرە نابینرێت تا سەرکۆنە و جوێنی پێ بدەیت. دواتر رووی کردە شەفیعی لۆلۆیی و وتی: لەزمانی منەوە بەسەروەری باوەڕداران بڵێ حامید شیاوی ئەوە نەبوو کاروباری وەزارەتی پێ بسپێردرێت. من بەڵێنم لێ سەند زیاتر لەدوو هەزار هەزار دینار بدات و بۆ وەرگرتنی ئەم پارەیە پێداگریم کرد بەڵام ئەو گومانی کرد دوای ئەوەی بوو بەوەزیر چیتر پێویست ناکات ئەم پارەیە بەگەنجینە بسپێرێت و بیری لەوە دەکاتەوە نەتەنیا نابێت ئەم پارەیە بدات بەڵکو دەبێت پارە پاشەکەوتی زیاتر بکات. حامید زیاتر توڕە و لەجوێندان و سەرکۆنە کردنی ئەو زێدەڕۆیی کرد. موقتەدری کەسی نارد تا بۆ زندان بیگوازنەوە. عەلی کوڕی عیسا و نەسری پەردەدار بەحامدیان وت: تۆ بەم کردەوەت بەرابەر بەکوڕی فورات خۆت و ئێمەت گوناحبار کرد و شەیتانێکت لەناخی ئەودا بزواند کەچیتر ناخەوێت.

دواتر دارایی کوڕی فورات دەستی بەسەردا گیرا و موحسنی کوڕی و هاوەڵانی ئەشکەنجە کران و بڕێکی زۆری پارەیان لێسەندرا.

لەم ساڵەدا نزار، فەرماندەی پاسەوانەکانی بەغداد لەسەر کار لابرا و نەجحی تولانی جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەو لەهەر گەڕێکیك شارەزایەکی ئایینی دانا تا پاسەوانەکان لەسەر بنەمای فتوای ئەوان هەڵس و کەوت بکەن. حکومەت بەم کارانە لاواز و دز و ئاژاوەگێڕەکان چاوی تەماحیان بڕییە سامانەکان و ئاژاوە سەری هەڵدا و شوێنە بازرگانییەکان تالان کرا و لەکوێرە ڕێگەکان کچەکانی خەڵکیان دەڕفاند. بەم شێوەیە خراپەکاری لەناو بەغداد بڵاو بوویەوە.

## ڕەوانە کرانی سوپا لەلایەن مەهدییەوە بۆ میسر

لەم ساڵەدا مەهدی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی کوڕەکەی، باوکی قاسم، رازاندەوە و بۆ جاری دووەم ڕەوانەی میسری کردن. ئەم سوپایە لەرەبیع الاخری ٣٠٧/ ئۆگۆستی ٩٢٠ گەیشتە ئەسکەندەرییە و فەرمانڕەوای موقتەدر شارەکەی بەجێهێشت و قاسم ڕۆشتە ناو شارەکە و لەوێوە هێرشی کردەسەر میسر. ئەو گەیشتە جیزە و دەستی بەسەر ئەشمونیندا گرت و بەشێکی زۆری سەرزەمینەکانی سوعەیدی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەو نامەیەکی بۆ دانیشتوانی مەککە نووسی و داوای لێکردن ملکەچی فەرمانەکانی بن بەڵام ئەوان رازی نەبوون.

ئەم هەواڵانە گەیشتە بەغداد و موقتەدر، مونسی خزمەتکاری لەشەعبان/ ژانویە بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. ئەو بەخێرایی خۆی گەیاندە میسر. لەنێوان ئەو و قاسم چەندین جەنگ روویدا. هەشتا کەشتی بۆ هاوکاری کردنی قاسم لەئەفریقییەوە گەیشت و لەئەسکەندەرییە لەنگەریان گرت. سلێمانی خزمەتکار و یەعقوبی کوتامی کەدرو پیاوی بوێر بوون و لەناو ئەم کەشتییانەدا دەبینران.

موقتەدر فەرمانیدا کەشتییەکانی تەرسوس بۆ هاوکاری مونس بەرێکەون. بیست و پێنج کەشتی بۆ ئەو دیارە بەرێکەوتن. ئەم کەشتییانە هەڵگری ئاگر هاویژ و نەوت پاش (ئەوەی نەوت دەپرژێنێت) بوون و باوکی یومن فەرماندەیی ئەوانی دەکرد. کەشتییەکان بەیەك گەیشتن و لەکەناری ڕەشید جەنگی دەستی پێکرد. کەشتییەکانی موقتەدر سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆر

لەکەشتییەکانی ئەفریقییە سوتێنران و زۆربەی سەرنشینەکانی ئەم کەشتییانە کوژران و ژمارەیەکیان ئەسیر بوون. سلێمانی خزمەتکار و یەعقوب لەناو دیلەکاندا دەبینران. ژمارەیەکی زۆر لەدیلەکان کوژران و ژمارەیەکیان رزگاریان بوو. سلێمان لەزیندانی میسر مرد و یەعقوبیان هێنایە بەغداد. ئەو لەوێوە هەڵات و خۆی گەیاندە ئەفریقییە.

لەنێوان سوپاکەی قاسم و مونس چەندین جەنگ روویدا و سەرئەنجام مونس سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لەم کاتەدا ئەویان بەنازناوی موزەفەر بانگ کرد.

لەم کاتەدا لەناو سوپاکەی قاسم، کۆلێرایەکی مەترسیدار بلاّو بوویەوە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان و چوارپێکان مردن. هەرکەس رزگاری بوو، خۆی گەیاندە ئەفریقییە و سوپاکەی میسر شوێنیان کەوتن تا ئەوەی لەو سەرزەمینە پاکە دوورکەوتنەوە. قاسم لەرەجەب/ دێسامبەری ئەم ساڵە گەیشتە مەهدییە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا بیشری ئەفشینی جەنگی لەگەڵ رۆمییەکان کرد و دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت و تالاّنی زۆری کۆکردەوە و خۆی تەندروست رزگاری بوو. سومل لەدەریایی رۆم، جەنگی کرد و تالاّنی زۆری بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد کوڕی حیمادی موسڵی، فەرمانڕەوایەتی موسڵی دەکرد.

لەم ساڵەدا جونی سەفوانی هێرشی کردە سەر رۆم و هەموو شتێکی فڕاند و هەموو ناوچەکانی وێران و سووتاند. نامەی سەرکەوتنەکانی ئەو لەسەر مینبەرەکانی بەغداد دەخوێندرایەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان خەڵکان و حەنبەلییەکان، شۆڕشێك لەبەغداد هاتە ئاراوە. خەلیفە دەستەیەك لەوانی گرت و ڕەوانەی بەسرەی کردن تا لەوێ زیندانی بکرێن.

لەم ساڵەدا موقتەدر فەرمانیدا نەخۆشخانەیەك دروست بکەن. خەرجی ئەم نەخۆشخانەیە زیاد لەرادە بوو. نەخۆشەکانە بەموقتەدر، ناوی دەرکرد.

لەم ساڵەدا قازی محەممەد کوڕی خەلەف کوڕی حەیانی ئەبوبەکری زەببی ناسراو بەبوکەیع کە شارەزای بارودۆخی خەڵکان و چەندین نووسراوی گرنگی بەجێهێشتووە لەگەڵ قازی باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی شورەیح کەپەنجا و حەوت ساڵ ژیانی کرد، کۆچی دواییان کرد.

لەم ساڵەدا کونەیزی گۆرانیبێژ مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەوتی کۆچی ( ٩٢٠ زایینی )

لەم ساڵەدا حامید کوڕی عەباس، کۆکردنەوەی باجی لەزەوییە تایبەت و گشتییەکانی فورات لەکەنارەکانی بەغداد، کوفە، واست، ئەهواز و ئیسفەهانی لەئەستۆ گرت.

هۆکاری لەم کارە ئەوە بوو کاتێك بینی توانای ئەنجامدانی کارەکانی لەدەست داوە و عەلی کوڕی عیسا خۆی بەتەنیا کارەکان بەڕێوە دەبات، ئەم هەنگاوەی هەڵگرت تا ناوی خۆی بێنێتە ناو ناوان و بەڕێوە بردنی کارەکان دووبارە بگرێتەدەست. ئەو لەموقتەدر داوای مۆڵەتی کرد تا بۆ کۆکردنەوەی ئەو بڕە پارەی لەسەرەتاوە بەڵێنیدابوو، بڕواتە واست. موقتەدر مۆڵەتی پێدا و ئەو کە بەوەزیر دەناسرا، بەرەو واست بەڕێکەوت و عەلی کوڕی عیسا کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد. حامید بەئاشکرا باجی زیاتری وەرگرت و پارەیەکی زۆری کۆکردەوە. موقتەدر شادمان و دەستی بۆ کارەکان ئاوەڵا کرد تا ئەو جێگەی عەلی کوڕی عیسا ترسی لێ نیشت.

لەم کاتەدا بەهای کەل و پەلەکان لەبەغداد بەرز بوویەوە و هەموان بەورد و بچوکەوە دەنگی ناڕەزاییان بەرز کردەوە و داوای هاوکارییان کرد و مینبەرەکانیان شکاند. لەم کاتەدا حامید و کەسانی دیکە دانەوێڵەی زۆریان پاشەکەوت کردبوو. چەند دووکانێکی ئارد فرۆشی تالأن کرا. موقتەدر، حامید کوڕی عەباسی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد وئەو لەئەهوازەوە بەڕێکەوت. خەڵکان دووبارە شۆڕشیان کرد. حامید دەستەیەکی بۆ سەرکوت کردنی ئەوان نارد. حامید ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئەوان، دوو پردەکەی بەغدادیان سووتاند و زیندانییەکانیان ئازاد و ماڵی فەرماندەی پاسەوانەکانیان تالأن کرد و هیچیان لەماڵەکەی بەجێنەهێشت. موقتەدر سوپایەکی بەفەرماندەیی غەریب ئەلخاڵ ڕەوانە کرد و ئەو ڕووبەڕووی خەڵکان بوویەوە. خەڵکان هەڵاتن و پەنایان بۆ مزگەوتی هەینی باب ئەلتاق برد. غەریب ئەلخاڵ کەسانێکی لای مزگەوتەکە دانا و هەرکەس لەناو مزگەوتەکەدا بوو، گرفتار بوو. ئەو دەستەیەك لەوانی ئەشکەنجە کرد و دەستی ژمارەیەکی بڕی کە

بەخراپەکاری ناویان دەرکردبوو.

بەیانی ئەو ڕۆژە موقتەدر فەرمانیدا ئەمان بەخەڵکان ببەخشن و بەم شێوەیە ئاگری شۆڕش دامرکایەوە. دوای ئەوە حامید سوار بەلەمێك بوو و بەرەو کۆشکی موقتەدر هەڵات و خەڵکان ئەویان بەردباران کرد. موقتەدر فەرمانیدا خەڵکان هێور بکەنەوە و خەڵکان ئارام بوونەوە. دواتر فەرمانیدا هەمارەکانی جۆ و گەنمی حامید و دایکی موقتەدر و کەسانی دیکەیان کردەوە و فرۆشتیان. بەهای کەل و پەلەکان دابەزی و خەڵکان دەستیان لەشۆڕش هەڵگرت. عەلی کوڕی عیسا بەموقتەدری وت: هۆکاری گرانی، پەیمانەکەی حامیدە (دانی ئەو برە پارەی بەڵێنیدا بوو) چوونکە ئەو لەفرۆشی گەنم و جۆ لەخەرمانەکان ڕێگری دەکرد و لەهەمارەکانی خۆی پاشەکەوتی دەکرد. موقتەدر فەرمانیدا گرنگی بەپەیمانەکەی حامید نەدرێت و کارگوزارەکانی ئەوی لەشارەکان گەڕاندەوە و فەرمانی بەعەلی کوڕی عیسادا جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست. بەم شێوە خەڵکان ئارام بوونەوە و ئاسوودە بوون. هاوەڵانی حامید گومانیان دەکرد ئەم شۆڕشە لەئەنجامی پیلانگێڕییەکانی عەلی کوڕی عیسا سەرچاوەی گرتووە.

## مردنی ئەحمەد کوڕی سەهل

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای خ سان و ماوەرا ئەلنەهر، بەسەر ئەحمەد کوڕی سەهل سەرکەوت. ئێمە پێشتر ئاماژەمان پێدا.

ئەحمەد کوڕی سەهل یەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد و کوڕی ئەو ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل و کوری ئەحمەد، نەسر کوڕی ئەحمەد بوو. پێشتر سەبارەت بەفەرماندەیی ئەو لەجەنگەکان قسەمان کردووە کەشایەتی کەسایەتی بەرزی ئەوە.

ئەو ئەحمەد کوڕی سەهل کوڕی هاشم کوڕی وەلید کوڕی جەبەلە کوڕی کامکار کوڕی یەزدگێرد کوڕی شەهریاری پاشا(دواین پاشای ساسانی) بوو. کامکار لەمەرو جووتیار بوو و گوڵی کامکاری لەناوی ئەو سەرچاوەی گرتووە. گوڵێکە سوور ڕەنگ کە لەڕەیی قەسرانی، عێراق و جەزیرە و شام بەجوری ناوی دەبرێت.

ئەم گوڵە بۆ قەسران دەگەڕێتەوە کەگوندێکە لەڕەی و هەروەها بۆ شاری جور یەکێك لەشارەکانی فارس.

ئەحمەد چەندین برای بوو بەناوەکانی محەممەد، فەزڵ و حەسەن و لەجەنگی نەژادپەرەستی عەرەب و فارس لەمەرو کوژران. ئەحمەد نوێنەری عەمرۆ کوڕی لەیس بوو لەمەرو. عەمرۆ ئەوی گرت و ڕەوانەی سیستانی کرد و لەوێ زیندانی کرا. ئەو لەزیندان لەخەودا کەسێك دەبینێت کەوەك دەڵێن یوسف بووە. یوسف پاڵی بەدرگای زیندانەکەوە داوە کەئەحمەد پێی دەڵێت: داوا لەخواوەند بکە لەم زیندانە رزگارم بکات و پێگەم بۆ فەرمانڕەوایەتی بەرز بکاتەوە. یوسف پێی دەڵێت: خواوەند رزگاریت پێ دەبەخشێت بەڵام راستەوخۆ هیچ کارێك بەتۆ ناسپێردرێت.

لەم کاتەدا ئەحمەد داوای کرد بیبەن بۆ گەرماو. ئەویان بردە گەرماو. ئەو گوێزانی هەڵگرت و سەر و ڕیشی خۆی تاشی. بەروخسارێك لەگەرماو هاتەدر کەس نەیناسیەوە. ئەو خۆی شاردەوە و عەمرۆ هەرچەند بەدوایدا گەڕا نەیدۆزییەوە. دواتر ئەحمەد لەسیستانەوە رووی کردە مەرو و نوێنەری عەمرۆی گرت و دەستی بەسەر مەرودا گرت و پەنای بۆ ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد لەبوخارا برد. ئیسماعیل رێزی لێگرت و پێگەی بەرز کردەوە. ئیسماعیل پیاوێکی بیرمەند و رازدار بوو.

کاتێك حسەین کوڕی عەلی ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە، ئەحمەدی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و وەك ئاماژەمان پێدا، ئەحمەد بەسەر حسەیندا سەرکەوت. ئەمیر نەسر لەگەڵ ئەحمەد چەندین پەیمانی بەست بەڵام هیچ کام لەبەڵێنەکانی نەبردەسەر. ئەحمەد دڵی ڕەش کرد تا ئەوەی رۆژێك یەکێك لەهاوەڵانی باوکی جەعفەری سەعلوك ڕۆشتە لای ئەحمەد کوڕی سەهل و ئەحمەد دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی و ئەوەی سامانییەکان پەیمانەکانیان خۆیان شکاندووە، ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان:

| | |
|---|---|
| ستقطع فی الدنیا اذا ما قطعتنی | یمینك فانظر ای کفیك تبدل |
| و فی الناس ان رثت حبالك و اصل | و فی الارض عن دارالعلی متحول |

اذا انت لم تنصف اخاك و وجدته ‌‌ ‌‌ على طرف الهجران ان كان يعقل
و تركب حد السيف من ان تضميه ‌‌ ‌‌ اذا لم يكن عن شفرة السيف مرحل
اذا انصرفت نفسى عن الشى لم تكد ‌‌ ‌‌ اليه بوجه آخر الدهر تقبل

واتاکەی: ئەگەر پەیوەندی خۆت لەگەڵ من بپچڕێنیت، دەستی راستی خۆت بڕیوە، هەنووکە بزانە کام یەك لەم دوو دەستە قەرەبوو دەکرێتەوە (من یا دەستی راستت) ئەگەر رشتەی پەیوەندی تۆ لەگەڵ من بەرەو نەمان بچێت، دووبارە پەیوەندی من لەگەڵ خەڵکان بەردەوام دەبێت و لەزەوی شوێنێکی بەرز دەست دەکەوێت تا من بەرەو ئەوێ بڕۆم. ئەگەر رێگەی دادپەروەری لەگەڵ براکەت نەگریتەبەر، ئەگەر کەمێك ئاوزی هەبێت، دەبینی لەتۆ دوورکەوتۆتەوە و ئەگەر ستەمی لێ بکەیت ئەمە تۆ و ئەم شمشێر چوونکە لەم کاتەدا کەس ناتوانێت لەتیژی شمشێر رابکات، هەرکات لەشتێك بێزار بووم چیتر تا کۆتایی رۆژگار ناگەرێمەوە بۆ لای.

هاورێی باوکی جەعفەری سەعلوك دەڵێت: زانیم ئەو ناسازگاری لەدڵدایە. دوای چەند رۆژێك، ئەو لەنەیشابور شۆرشی کرد و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و چیتر رێگەی نەدا ناوی سەعید نەسر کوری ئەحمەد لەناو وتارەکاندا بهێنن. ئەو نوێنەرێکی بۆ بەغداد نارد تا فەرمانڕەوایی سەرزەمینەکانی خوراسان بەو بسپێردرێت.

ئەحمەد کوری سەهل لەنەیشابورەوە رووی کردە جورجان. جورجان لەو کاتەدا لەژێر فەرمانڕەوایەتی قەراتکیندا بوو. ئەو لەگەڵ قەراتکین جەنگی و دەستی بەسەر جورجاندا گرت و قەراتکینی لەوێ دەرکرد و دواتر بۆ خوراسان گەڕایەوە و مەبەستی رۆشتن بۆ شاری مەروی کرد و بەسەریدا زاڵ بوو. ئەو لەوێ دیوارێکی دروست کرد و سەنگەری گرت. سەعید نەسر سوپایەکی بەفەرماندەیی حەمویە کوری عەلی لەبوخاراوە رەوانە کرد. ئەو گەیشتە مەرو روود و لەکەنارەکاندا مایەوە تا ئەحمەد کوری سەهل بۆ جەنگی ئەو بێتەدەر بەلام ئەحمەد ئەو کارەی نەکرد.

رۆژێك یەکێك لەهاوەلانی ئەحمەد رۆشتە لای ئەو و بینی بیر لەهاتنی حەمویە

دەکاتەوە. وتی: بێ هیچ گومانێك فەرمانڕەوا بیر لەم گرفتارییە دەکاتەوە، هەنووکە چی بەباش دەزانی؟ ئەحمەد وتی: بیرم لەوەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە، نەدەکردەوە، بیرم لەخەوەکەی خۆم لەزیندانەکەی سیستان دەکردەوە. دواتر ئەم وتەی یوسفی هێنایە سەرزمان کە: تۆ راستەوخۆ هیچ کارێکت پێ ناسپێردرێت. ئەو پیاوە وتی: پێم وت: بزانە ئەم دەستەیە (سامانییەکان) سازانی تۆ بەدەرفەت دەزانن و ئەوەی بخوازیت، بەتۆی دەدەن. ئەگەر بەباشی دەزانی کەسێك وەك نێوەنجیگەر ڕەوانە بکە. ئەحمەد ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان:

ساغسل عنی العار بالسیف جالبا                    علی قضاالله ما کان جالبا

واتاکەی: ئەنگ و ریسوایی بەشمشێر لەخۆم دوور دەکەمەوە و فەرمانەکانی خواوەند بۆ لای خۆم دەهێنم _ئەگەر بتوانم ئەو کارە بکەم-.

کاتێك حەمویە بینی ئەحمەد مەرو بەجێناهێڵێت، بیری لەچارە کردەوە. لەبەر ئەمە، ئەم وتانەی هێنایە سەرزمان: من ئەحمەد کوڕی سەهلم خزاندۆتە ناو کونی مشك و رێگەی هەڵاتنم لێگرتووە. وتەی لەم شێوەی لەناو خەڵکدا بڵاو کردەوە تا ئەحمەد تورە بێت و لەمەڕو بڕوات بەڵام ئەحمەد ئەو کارەی نەکرد. لەم کاتەدا حەمویە فەرمانی بەدەستەیەك لەسەرکردە بڕواپێکراوەکانی خۆیدا بەشێوەیەکی نهێنی نامەیەك بۆ ئەحمەد کوڕی سەهل بنوسن و خوازیاری پەیوەست بوون بەو بن و داوای لێبکەن لەمەرو بێتەدەر تا حەمویەی رادەست بکەن. ئەحمەد لەبەر بێزار بوونی لەحەمویە بەم پێشنیارە رازی بوو و لەمەرو، هێرشی کردە سەر حەمویە و لەرەجەبی ٣٠٧/ نۆڤەمبەری ٩١٩ زایینی هەردوو سوپا لەیەك مەنزڵی مەروروود رووبەرووی یەکبوونەوە و سوپاکەی ئەحمەد شکستی خوارد و ئەو بەرادەیەك جەنگی کەئەسپەکەی تواناى لەدەستدا. ئەو لەئەسپەکەی خۆی دابەزی و داوای ئەمانی کرد. ئەویان ئەسیر کرد و ڕەوانەی بوخارایان کرد و ئەحمەد کوڕی سەهل لەزیحەججەی ٣٠٧/ئاوریلی ٩٢٠ زایینی لەزیندانی بوخارا کۆچی دوایی کرد.

ئەمیر ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل بەردەوام دەیوت: ئەحمەد کوڕی سەهل شیاو نییە لەبارەگای ئەو بەدوور بێت چوونکە لەم کاتەدا ئاژاوە سەر هەڵدەدات. ئەمەی

لەئەحمەد کوڕی سەهل هەست پێدەکرد بەڵێ، پاشا دەبێت بەم شێوەیە بیر تیژ بێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەلایەن بەغدادەوە ئاگرێك کەوتە کەرخ کەژمارەیەکی زۆر لەماڵەکان و خەڵکانی سوتاند.

لەم ساڵەدا سەرزەمینی ڕەبیعە بەئیبراهیم کوڕی حەمدان سپێردرا و بەنی کوڕی نەفیس دەستی بەسەر شارەزوردا گرت بەڵام دانیشتوانی ئەم شارە ڕێگەیان نەدا بڕواتە ناو شارەکە و ئەو داوای هاوکاری لەموقتەدر کرد و سوپایەك بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرا. ئەم سوپایە گەمارۆی خستە سەر شارەزور بەڵام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت و لەوێوە بۆ جەنگی موسڵ و کەنارەکان ڕەوانە بوو.

لەم ساڵەدا سەمەل، فەرماندەی جەنگی دەریایی، لەگەڵ چەندین کەشتی بۆ جەنگ لەگەڵ مەهدی عەلەوی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە بەرێکەوت و دەستەیەك لەوانی کوشت و خزمەتکارەکەی مەهدی گرت.

لەم ساڵەدا ئەستێرەکەی گەورە (بەردی ئاسمانی) لەئاسمان کەوتەخوار و تیشکێکی گەورەی بڵاو کردەوە و دواتر بوو بەسێ بەش. کاتی کەوتنە خوارەوەی بەردەکە دەنگێك هاوشێوەی هەورەبروسکە بەرز بوویەوە. ئەو شەوە هەور بەئاسمانەوە نەدەبینرا.

لەم ساڵەدا لەنێوان خواردەمەنیی فرۆشەکان و پینەچییەکانی موسڵ ئاژاوەیەك هاتە ئاراوە و بازاری پێڵاودوورەکان سووتا. لەم کاتەدا فەرمانڕەوای موسڵ و کەنارەکانی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی کونداج بوو و کاتێك هەواڵی ئاژاوەکەی بیست، بۆ سەرکوت کردنی خەڵکان موسڵ گەڕایەوە. دانیشتوانی موسڵ مەبەستی بەرگری کردنیان کرد و سەنگەریان هەڵکەند و ڕێگەکانیان بەست. کاتێ کوڕی کونداج ئەمەی زانی، لەجەنگ چاوپۆشی کرد و فەرمانی بەعەرەبەکانی دەوروبەری شارەکەدا گەرەکانی ئەوان وێران بکەن. عەرەبەکان خەڵکیان لەسەر پرد و گۆڕپانەکەدا خەڵکیان ڕووت دەکردەوە و کاڵاکانیان لەناو خۆیاندا دابەش دەکرد.

بەم شێوەیە شارەکە بەرەو وێرانی ڕۆشت. هەواڵی ئەم ئاژاوەیە بەخەلیفە گەیشت و ئەو لەساڵی ٩٢١/٣٠٨ زایینی کونداجی لابرد و عەبدوللە کوڕی محەممەدی فەتانی لەجێگەی ئەو دانا. ئەو پیاوێکی داوێن پاك و بوێر بوو. بەم شێوەیە عەرەبەکان دەستیان لەموسڵ هەڵگرت.

لەم ساڵەدا باکوی یەعلی ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی موسەنای موسڵی، نوسەری (مسند) کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتی کۆچی ( ۹۲۱ زایینی )

لەم ساڵەدا موقتەدر بەباوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان خەڵاتی بەخشی و ڕێگەی خوراسان و دەینەوەری بەو سپارد. هەروەها بەدوو براکەی ئەو باوکی عەلا و باوکی سەرایا خەڵاتی بەخشی.

لەم ساڵەدا براکەی سەعلوك لەگەڵ سامان و دارایی فراوان هاتە بەغداد و هەواڵی هێنا کەئەوان ملکەچی فەرمانەکانی موقتەدری خەلیفەن.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی حەمدان لەمانگی موحەرەم/ مەی کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا دەقوقا، عوکبرا و ڕێگەی موسڵی خستە ژێر فەرمانی بەدری شەرابی.

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی سوفیان، هاوڕێی موسلیم کوڕی حەجاج (نوسەری کتێبی مسندی موسلیم) مرد. صحیحی موسلیم تا بەمرۆ لەوتەکانی ئەو دەگێڕدرێتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و نۆی کۆچی (٩٢٢زایینی)

## کوژرانی لەیلی کوڕی نومانی دەیلەمی

لەم ساڵەدا لەیلی کوڕی نوعمانی دەیلەمی کوژرا. ئەو سەرکردەی یەکێك لەمناڵەکانی ئەتروشی عەلەوی بوو و فەرمانڕەوایەتی جورجانی دەکرد. حەسەن کوڕی قاسمی داعی ئەو لەساڵی ٩٢١/٣٠٨ زایینی وەك کارگوزاری جورجان دیاری کردبوو. مناڵەکانی ئەتروش لەنامەکانی خۆیاندا ئەویان بەمۆئەییەد لدین الله مونتەسیر لآل رسول الله (مۆئەییەدی دینی خواوەند و هاوکاریکەری بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)) لەیلی کوڕی نوعمان ناودەبرد. ئەو پیاوێکی بوێر، بەخشندە و لەسەختییەکان پێشڕەو بوو.

ئەو لەجورجانەوە بەرەو دامەغان بەرێکەوت و ڕووبەڕووی دانیشتوانەکەی بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و بۆ جورجان گەڕایەوە. دامغانییەکان قەڵآیەکیان بەرز کردەوە تا پەنای تیا بگرن. قەراتکین هێرشی کردە سەر لەیلی لەجورجان و لەدە فەرسەنگی شارەکە ڕووبەڕووی بوویەوە و قەراتکین شکستی خوارد. کۆیلەکەی بارس( ئەگەری هەیە پارس) لەگەڵ هەزار سوار داوای ئەمانی لەلەیلی کرد. لەیلی ڕێزی گرت و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری ئەو. باوکی قاسم کوڕی حەفس، خوشکەزای ئەحمەد کوڕی سەهل داوای ئەمانی لەلەیلی کرد و لەیلی پێی بەخشی.

سوپاییەکی فراوان لەدەوری لەیلی کوڕی نوعمان کۆبوویەوە و خەرجییەکانی زیادی کرد. لەیلی بەفەرمانی حەسەن کوڕی قاسمی داعی و هاندانی باوکی قاسم کوڕی حەفس هێرشی کردە سەر نەیشابور. لەم کاتەدا قەراتکین فەرمانڕەوایەتی نەیشابوری دەکرد. لەیلی لەزیحەججەی ٣٠٨/ ئاوریلی ٩٢١ زایینی ڕۆشتە نەیشابور و بەناوی داعی وتاری خوێندەوە. سەعید نەسر، حەمویە کوڕی عەلی لەبوخاراوە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و دوو سوپا لەتوس جەنگان. زۆربەی هاوەڵانی حەمویە کوڕی عەلی تامەرو هەڵاتن بەڵام حەمویە و محەممەد کوڕی

عەبدوللەی بەڵغەمی و باوکی جەعفەری سەعلوك و خوارەزم شا و سییجوری دەواتی خۆڕاگرییان کرد و شمشێریان وەشاند. ژمارەیەك لەسەربازەکانی لەیلی هەڵاتن و لەیلی خۆی لەگەڵ ئەوان هەڵات. لەیلی گەیشتە گەڕەکێك کەرێگەی هەڵاتنی نەبوو. بوغرا خۆی پێگەیاند و لەیلی نەیتوانی خۆی دەرباز بکات. لەئەسپەکەی دابەزی و ڕۆشتە ناو ماڵێك. بوغرا ئەوی گرت و حەمویەی لەگرفتار بوونی ئەو ئاگادار کردەوە. حەمویە کەسی نارد بۆ ئەوەی سەر لەجەستەی لەیلی جیا بکاتەوە. ئەوی سەری لەیلی بەڕمەوە کرد و کاتێك هاوەڵانی لەیلی ئەوەیان بینی، پێشنیاری ئەمانیان بەرز کردەوە و حەمویە ئەمانی پێبەخشین.

لەم کاتەدا حەمویە بەسوپاییەکانی وت: خواوەند سەرکەوتنی بەسەر دیوەکانی کوێستان و دەیلەم پێبەخشین. کەواتە لەناویان ببەن بۆ ئەوەی هەمیشە بحەسێنەوە بەڵام سوپاییەکان ئەو کارەیان نەکرد و هەرسەرکردەیەك دەستەیەکی هەڵگرت و ڕۆشت. لەیلی لەرەبیع الاوەلی ۳۰۹/ جولای ۹۲۱ زایینی کوژرا و سەری ئەویان بردە بەغداد و بارس، کۆیلەی قەراتکین، لەجورجان مایەوە.

دەڵێن: کاتێك حەمویە مەبەستی جەنگی لەیلی کرد، پێیان وت: لەیلی لەڕۆشتنی تۆ بۆ جەنگ، ساتەکان دەبژێرێت. حەمویە وتی: لەم جەنگەدا من یەکێك لەجزمەکانی خۆم ئەمساڵ و تاکەی دیکەی ساڵێکی دیکە لەپێ دەکەم. ئەم وتەیە بەلەیلی گەیشت. وتی: من یەکێك لەجزمەکانی خۆم بەدانیشتنان و ئەوی دیکەیان بەپێوە یا بەسوار لەپێ دەکەم. کاتێك لەیلی کوژرا، حەمویە وتی: ئەمەیە ئەنجامی ئەو کەسەی بۆجەنگ دەکەوێتە هەڵپەهەڵپ.

## کوژرانی حسەین کوڕی مەنسور حەلاج

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی مەنسوری حەلاجی سۆفی[٧] کوژرا و سوتێنرا. ئەو

---

[٧]- باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی مەنسور، عارف و سۆفی بەناوبانگی ئیسلام، لەدەوروبەری ٢٤٤ کۆچی لەبەیزا نزیك ئیستەخر چاوی بەدنیا هەڵهێنا. لەتەمەنی منالیدا لەگەڵ باوکی رووی کردە واست و لەشانزە ساڵ بووبە شاگردی یەکەم پیر و رێنیشاندەری خۆی، سەهل کوڕی عەبدوللەی تەستەری. ئەو دوو ساڵ خزمەتی سەهلی کرد و دوای دوورخستنەوەی ئەو بۆ بەسرە، حەلاج لەگەڵ ئەو رۆشتە بەسرە. حەلاج لەساڵەکانی ٢٦٢ کۆچی لەبەسرەوە رێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەوێ هەژدە مانگ لای عەمرۆ مەککی دەرسی خوێند و لەم شارەدا بوو لەگەڵ دایکی حسەین کچی یەکێك لەسۆفییە بەناوبانگەکان بەناوی باوکی ئەعقوبی ئەقتەع پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. حەلاج لەسەراسەری ژیانی تەنیا ئەم ژنەی هێنا و وەك ئاشکرایە لەم ژنە سێ کوڕ و کچێکی بۆ هاتەدنیا. پەیوەندی هاوسەرگیری حەلاج لەگەڵ کچی باوکی یەعقوبی ئەقتەع لای مامۆستاکەی -عەمرۆ مەککی- پەسەند کراو نەبوو. حەلاج بەناچاری ئەوی بەجێهێشت و بوو بەشاگردی باوکی قاسم جونەیدی بەغدادی.

حەلاج دوای ئەوەی چەند ساڵێك لەبەغداد مایەوە، جارێکی دیکە رۆشتە شوشتەر و لەوێوە بوو گەشتی بانگەواز کردنی خۆی دەستپێکرد. حەلاج لەساڵی ٢٧٠ لەتەمەنی بیست و شەش ساڵی یەکەم جار حەجی کرد و لەوێ ساڵێکی بەریازەت و عیبادەت و رۆژوو گرتن بەسەر برد و کاتێك لەمەککە بۆ ئەهواز گەڕایەوە، دەستی بەرێنوێنی کردنی خەڵکان کرد. خۆی بۆ رەخنە گرتن لەکردەوەی ناپەسەندی عەمرۆ مەککی و بانگەشە کردن دژی ئەو، جل و بەرگی دەرهێنا و سەفەری دەستپێکرد. رۆشتە خوراسان، تاڵەقان، بەسرە، واست، شوشتەر و بەغداد. ئەو دووەم سەفەری خۆی بۆ مەککە لەگەڵ چوارسەد مورید دەست پێکرد و دوای گەڕانەوە بەمەبەستی رێنیشاندانی خەڵکان بۆ هیندستان، تورکستان، غورجستان، ئەفغانستان، کشمیر و چین سەفەری کرد و پێشنیاری ئایینی ئیسلامی بەبتەپەرەستەکانی ئەو سەرزەمینانە کرد.

حەلاج لەساڵی ٢٩٤ سێیەم حەجی خۆی کرد کەماوەی دوو ساڵ درێژەی کێشا و دوای گەڕانەوە بۆ بەغداد سەرقاڵی رێنوێنی کردنی خەڵکان بوو. لەم ساڵەدا بووبەروودانی ئاژاوەی لابردنی موقتەدر و بەیعەتی دەستەیەك لەسەرکردەکانی حکومەت لەگەڵ کوڕی موعەز، بەغداد گرفتاری پەرێشانی و نائارامی بوو. دەستەیەك گومانیان وابوو ئەم ئاژاوەیە بەهۆی پێشنیارەکانی حەلاجەوە سەری هەڵداوە. لەبەر ئەمە حەجاج لەبەغداد هەڵات و رێگەی شوشی گرتەبەر و ماوەیەك لەوێ خۆی شاردەوە بەڵام بەهۆی خیانەتی یەکێك لەقوتابییەکانی، شوێنی خۆ شاردنەوەی ئەویان دۆزییەوە و گرتیان و سوار لەسەر وشتر بردیان بەغداد. لەساڵی ٣٠٢ کۆچی یەکەم دادگایی کردنی حەلاج لەبەغداد ئەنجامدرا کە بەئەشکەنجە و هەشت ساڵ زیندانی ئەو لەزیندانەکانی بەغداد کۆتایی بەکارەکانی هێنا. ئەو دوای ئازدای بەهۆی نزیکی لەگەڵ دایکی خەلیفە، کەم کەم پێی بۆ کۆشکی خەلافەت کرایەوە بەڵام نەیارەکان کەکارەکانی ئەویان بەسیحر و جادوو لەقەڵەم دەدا، خەلیفەیان لەمەترسییەکانی حەلاج ئاگادار کردەوە. لەبەر ئەمە حامید کوڕی عەباسی وەزیر داوای لەموقتەدر کرد دووبارە حەلاج دادگایی بکرێت. لە٣٠٩ کۆچی دووەم دادگایی حەلاج بۆ ماوەی حەوت مانگ بەئامادە بوونی حامیدی وەزیر درێژەی کێشا و سەرئەنجام بەهاندانی هاورێی وەزیر و هاوپیاڵەکانی ئەو و چەندین شایەت، شایەتییان بۆ بێهودەیی کار و وتار و باوەڕەکانی حەلاجدا و بەم شێوەیە لەرۆژی سێ شەممە، بیست و چواری زیقەعدەی ٣٠٩ کۆچی حەلاجیان بۆ ئیعدام کردن برد. جەلاد، سەرەتا هزار قامچی لێدا، دواتر دەست و قاچیانبڕییەوە جەستەی نیوەگیانیان بەدارەوە هەڵواسی و

لەسەرەتا خۆ دوورخستنەوە لەدنیا و سۆفیگەری کردە پیشە و چەندین کاری نائاسایی لەخۆی نیشاندا. لەهاویندا میوەی زستانە و لەزستان میوەی هاوینەی بەخەڵکان دەدا. حەلاج دەستی خۆی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و دەستەکانی پڕ دەبوو لەدرهەم کە لەسەریان نووسرابوو قل هو الله احد. ئەمانەی بەدرەمی هێز ناو دەبرد. ئەو پێشگۆیی دەکرد کەخەڵکان چییان خواردووە یا لەماڵەوەی چییان کردووە و لەناخی خۆیان ئاگاداری دەکردنەوە. بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان گومرا بوون و هاوشێوەی عیسا سەبارەت بەو کەوتنە ناسازگاری. دەستەیەك دەیانوت بەشێکی خوایی تێکەڵ بەجەستەی بووە و بانگەشی خوایەتی ئەویان دەکرد. دەستەیەك ئەویان بەجێگری خوا دەزانی و ئەوەی کارەکانی ئەو نیشانەی پیاوە داوێن پاکەکانە. دەستەیەك ئەویان بەفاڵگیر و جادووگەر و درۆزن لەقەڵەم دەدا کەجنۆکەکان فەرمانبەری ئەو دەکەن و میوەکان لەوەرزێکی دیکە بۆ ئەو دەهێنن.

ئەو لەخوراسانەوە بەرەو عێراق بەرێکەوت و یەك ساڵ لەحوجر مایەوە. ئەو لەم ساڵەدا لەزستان و هاوین هیچ پەناگە یا سەقفێکی هەڵنەبژارد و بەردەوام بەرۆژوو بوو. کاتێك کاتی رۆژوو شکاندن دەهات، خزمەتکار گۆزەیەك ئاو و نانێکی بۆ دەهێنا. چەند قوم ئاوی دەخواردەوە و بەددان سێ تیکەی لەنانەکە دەکردەوە و پاشماوەکەی لادەبرد و کەسانی دیکە هەڵیان دەگرتەوە و تا کۆتایی رۆژی دواتر هیچی نەدەخوارد.

شێخی سۆفییەی مەککە لەو کاتەدا عەبدوڵلەی مەغربی بوو. ئەو هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان سەردانی حەلاجی کرد بەڵام حەلاجی لەحوجرنەبینی. پێی وترا: حەلاج بەکێوی باوکی قوبەیس سەرکەوتووە. عەبدولله بەسەر کێوەکەدا سەرکەوت. حەلاجی بینی بێ پێڵاو و رووت لەسەر بەردێك دانیشتووە و ئارەق لەجەستەی دەبارێت. عەبدولله کاتێك ئەوی بینی، هاوەڵانی کۆکردەوە و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، گەڕایەوە. ئەو بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەم پیاوە

---

بەیانی ئەو رۆژە بەفەرمانی خەلیفە سەریان لەجەستە جیا کردەوە و جەنازەکەیان سوتاند و خۆڵەمێشەکەیان ڕژاندە ناو رووباری دیجلە.

بۆ خۆڕاگری کردن و بەتواناببوون لەبەرابەر خواستی خواوەند، خۆی دەخاتە دژوارییەوە و بەم زووانە خواوەند گرفتاری دەکات بەشێوەیەك هێزی خۆڕاگری لەدەست دەدات. حەلاج بۆ بەغداد گەڕایەوە.

چۆنیەتی کوژرانی ئەو بەم شێوەیە کاتی گەڕانەوەی ئەو بۆ بەغداد، بەحامید کوڕی عەباسی وەزیریان وت کەئەو گیانی بەچەند مردوویێك بەخشیوە و مردووەکان زیندوودەکاتەوە و جنۆکەکان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەون و هەرچی بخوازێت، بۆی ئامادە دەکەن و ئەویان پێش کەسانی نزیکی خەلیفە خستووە و نەسر حاجب و کەسانی دیکە خوازیاری شوێنکەوتن و پەیوەست بوون بەون. حامیدی وەزیر داوای لەموقتەدر کرد حەلاج و هاوەڵانی بەو بسپێرێت. نەسری پەردەدار بەرگری لێکرد بەڵام وەزیر پێیداگرت و موقتەر فەرمانیدا ئەو بەحامید بسپێرن. حامدی ئەو و پیاوێکی دیکەی بەناوی شەمری (سەمیری) و دەستەیەکی دیکە کەحەلاجیان بەخوا دەزانی گرت و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردن و هەموان وتیان باوەڕدار بوون بەخواوەندی حەلاج لەڕوانگەی ئەوانەوە ڕاستە و ئەوەی کەئەو گیان بەمردووەکان دەبەخشێتەوە. ئەو ئەم وتەی لەبەردەم حەلاج هێنایە سەرزمان. حەلاج حاشای لێکرد و وتی: پەنا بەخوا لەوەی بانگەشەی خوایەتی یا پێغەمبەرایەتی بکەم. بەندەیەکم کەخواوەند دەپەرەستم. حامید، باوکی عەمرۆ قازی و باوکی جەعفەر کوڕی بەهلولی قازی و دەستەیەك لەفەقیهەکانی کۆکردەوە و داوای فتوای لێکردن. وتیان: ناتوانین فتوا بدەین مەگەر ئەوەی بەڵگەیەکمان دەست کەوێت تا کوشتنی ئەو بەرەوا بزانین. ناتوانین پشت بەوتەی کەسانی دیکە ببەستین مەگەر ئەوەی وتەیەك کەخۆی پشتراستی بکاتەوە. حامید، حەلاجی بردە بارەگاکەی خۆی و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد بەڵام لەوتەکانی ئەو هیچ شتێك لەوەی لەگەڵ ئایینی ئیسلام ناسازگار بێت، بەدەست نەهات.

ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا و حامید بۆ لەناوبردنی حەلاج هەوڵی دەدا. ئەو و حەلاج چەندین بەسەرهاتیان هەیە کەگێڕانەوەیان دەبێتە هۆی درێژدادڕی لەم کتێبەدا تا ئەوەی سەرئەنجام وەزیر کتێبێی حەلاجی بینی کەتیایدا نووسرابوو هەرکەسێك مەبەستی حەج کردنی بێت بەڵام توانای ئەو کارەی نەبێت، ژوورێك

لەماڵەکەی خۆی کەپاك بێت و کەس نەڕۆشتبێتە ناوی، هەڵبژێرێت و لەڕۆژەکانی حەجدا بەدەوری ماڵەکەدا بسورێتەوە و ئەو کارە بکات کەحاجییەکان دەیکەن. دواتر سیٚ منالی باوك مردوو بێنێت و باشترین خواردنیان بۆ ئامادە بکات و لەو ژورەدا خواردنیان پیٚ بدات و خۆی بەدەستی خۆی خزمەتیان بکات. کاتێك لەخواردن تەواو بوون، جل و بەرگیان لەبەر بکات و یەکی حەوت درهەمیان پیٚ بدات و کاتێك ئەو کارەی کرد، وەك ئەوە وایە حەجی کردبێت.

کاتێك ئەم کتێبە لای وەزیر خوێندرایەوە، باوکی عەمرۆی قازی بەحەلاجی وت: ئەمەت لەکوێوە هێناوە؟ حەلاج وتی: لەکتێبی اخلاصی حەسەنی بەسری وەرم گرتووە. قازی پێی وت: خوێنت ڕەوایە، درۆ دەکەیت، ئێمە ئەو کتێبەمان لەمەککە خوێندۆتەوە و ئەم بابەتەمان تیا نەبینیوە. کاتێك قازی وتی، خوێنت ڕەوایە و وەزیر ئەمەی بیست، بەقازی وت: بینوسە. باوکی عەمرۆ ئەو کارەی نەکرد بەلاٚم حامید ناچاری کرد. ئەو فەرمانی ڕەوا بوونی خوێنی حەلاجی نووسی و دوای ئەو ئامادەبووان شایەتییان دا.

کاتێك حەلاج ئەم وتەی بیست، وتی: خوێنی من بۆ ئێوە ڕەوا نییە، چوونکە باوەڕم بەئیسلام هەیە و ئایینەکەی دینەکەی خۆم باش دەزانم و کتێبێکم لەمبارەوە نووسیوە. خواوەندا، خواوەندا، خوێنی من و خەڵکان بلاٚوەیان لێکرد.

وەزیر نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و بۆ کوشتنی حەلاج داوای مۆڵەتی لێکرد و فتواکانی لەگەڵ نامەکەی خۆیدا ڕەوانە کرد. خەلیفە ‌ ڕمان و مۆڵەتی کوشتنی پێدا. وەزیر حەلاجی بەفەرماندەی پاسەوانەکان سپارد. ئەو هەزار قامچی لەحەلاجدا بەلاٚم حەلاج تەنانەت یەك ئاخی نەهێنایە سەرزمان. دواتر دەستێك و قاچێکی حەلاج و دواتر دەست و قاچەکەی دیکەیشی بڕی و سەرئەنجام ئەویان کوشت و جەنازەکەیان سوتاند و خۆڵەمێشەکەیان کردە زەریا. سەری ئەویان لەبەغداد هەڵواسی و دواتر ڕەوانەی خوراسانیان کرد چوونکە شوێنکەوتەکانی لەو دیارە فراوان بوون. دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی دەیانوت ئەو نەکوژراوە و سوار لەسەر چوارپیٚ بینراوە و چل ڕۆژی دیکە دەگەڕێتەوە. دەستەیەکیش دەیانوت: لەڕێگەی نەهرەوان سوار لەسەر گوێدرێژێك بینیویانە و حەلاج پێی

وتوون: هاوشێوەی ئەو مانگایانە مەبن کەگومان دەکەن ئەشکەنجەیان کردووم و دواتر منیان کوشتووە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەرەبیع الاوەل/ جولای ئەم ساڵە ئاگرکەوتنەوەیەکی گەورە لەکەرخ ڕوویدا و ژمارەیەك سووتان.

لەجومادی الاوەل/ سێپتامبەری ئەم ساڵە موقتەدر، محەممەد کوڕی نەسری پەردەداری وەك سوپاسالاری سوپای موسڵ دەستنیشان کرد و خواردەمەنی و دانەوێڵەی ئەم شارەی بەو سپارد. نەسری پەردەدار لەم ساڵەدا بەرەو موسڵ بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەو شارە، لەگەڵ کوردەکانی مارانی جەنگی و ژمارەیەکی کوشت و ئەسیری کرد. هەشتا و چەند ئەسیری بۆ بەغداد نارد و ئەوانیان بەریسوایی بردە ناو شارەکان (شێوەی هەمیشەیی عەرەبەکان بۆ هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دیل و گرفتارانی جەنگ).

لەم ساڵەدا داود کوڕی حەمدان فەرمانڕەوایەتی دیاری ڕەبیعەی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی سەهل کوڕی عەتای ئادەمی سۆفی لەشێخە گەورەکان و زاناکانی سۆفییە و باوکی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی هارونی حەرانی پزیشك و باوکی محەممەد عەبدوللە کوڕی حەمدون کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و دەی کۆچی (٩٢٣ زایینی)

## جەنگی سیمجور لەگەڵ باوکی حسەین کوڕی عەلەوی

باسی چۆنیەتی کوژرانی لەیلی کوڕی نوعمانمان کرد و وتمان بارس، کۆیلەی قەراتکین لەجورجان مایەوە. کاتێك لەیلی کوڕی نوعمان کوژرا، قەراتکین بۆ جورجان گەڕایەوە و کۆیلەکەی بارس داوای ئەمانی لێکرد بەڵام قەرتکین کوشتی (چوونکە خیانەتی لێکرد و پەنای بۆ لەیلی بردبوو). قەراتکین لەجورجان گەڕایەوە و باوکی حسەین کوڕی حەسەن کوڕی عەلی ئەتروشی عەلەوی کەنازناوی باوکی ناسرە، هاتە جورجان و لەوێ مایەوە. سەعید نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی، سیمجوری دەواتی لەگەڵ چوار هەزار کەس بۆ جەنگی باوکی حسەین ڕەوانە کرد. سیمجور لەدوو فەرسەخی جورجان ئوردووی لێدا و بۆ ماوەی یەك مانگ گەمارۆی خستە سەر باوکی حسەین. باوکی حسەین لەگەڵ هەشت هەزار دەیلەمی و جورجانی بۆ جەنگی سیمجور هاتەدەر. فەرماندەی سوپاکەی ئەو سورخاب کوڕی وەهسوزان کوڕە مامی ماکان کوڕی کالی دەیلەمی بوو. هەردوو سوپا جەنگێکی بوێرانەیان لەخۆیان نیشاندا. سیمجور چەند بۆسەیەکی نایەوە بەڵام بەهۆی کەمتەرخەمی ئەوان سیمجور شکستی خوارد و هاوەڵانی باوکی حسەین هاتنە ناو ئوردووگاکەی سیمجور و تاڵانیان کرد. دوای سەرکەوتنی باوکی حسەین، ئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، هاتنەدەر و نزیکەی چوار هەزارکەس لەدەیلەمییەکان وجورجانییەکانیان کوشت و باوکی حسەین هەڵات و خۆی هەڵدایە ناو ڕووبارە و بۆ ئێستر ئاباد گەڕایەوە. هاوەڵە هەڵاتووەکانی لەو ناوچەیە لەدەوری کۆبوونەوە.

سورخاب کاتی هەڵاتنی سیمجور شوێنی کەوت و کاتێك گەڕایەوە، بینی هاوەڵانی کوژراو و ئاوارە بوون. لەبەر ئەمە ڕێگەی ئێستر ئابادی گرتەبەر و بنەماڵەی هاوەڵان و پاشماوەکان هاورێیەتیان دەکرد و لەگەڵ باوکی حسەین کوڕی ناسر لەوێ مایەوە. سیمجور لەسەرکەوتنی هاوەڵانی خۆی ئاگادار بوویەوە

و گەڕایەوە و لەجورجان نیشتەجێ بوو. لەم کاتەدا سورخاب نەخۆش کەوت و مرد. کوڕی ناسر بۆ ساری گەڕایەوە و کاکان کوڕی کالی وەك جێگری خۆی لەئێسترئاباد دیاریکرد. دەیلەمییەکان لەدەروی کۆبوونەوە و ئەویان پێش خست و وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵیانبژارد.

لەم کاتەدا محەممەد کوڕی عەبدوللەی بەلغەمی و سیمجور گەیشتنە دەروازەی ئێسترئاباد و جەنگیان لەگەڵ ماکان کوڕی کالی دەستپێکرد. لەبەر ئەوەی ئەم شەڕە درێژەی کێشا، لەگەڵ ماکان کوڕی کالی پەیمانی ئاشتییان بەست کە لەبەرابەر وەرگرتنی پارە ئێسترئاباد بەرەو ساری بەجێبێڵێت و وا نیشان بدات کەبەلغەمی و سیمجور دەستیان بەسەر شارەکەدا گرتووە. دواتر بەلغەمی و سیمجور شارەکە بەجێبێڵن و ماکان کوڕی کالی بۆ ئێسترئاباد بگەڕێتەوە. ماکان کوڕی کالی ئەو کارەی کرد و بەرەو ساری کەوتە ڕێ. هاوەڵانی بەلغەمی و سیمجور لەئێسترئابادەوە بەرەو جورجان و لەوێوە بەرەو نەیشابور ڕۆشتن. ئەوان بوغرایان وەك نوێنەری خۆیان لەئێسترئاباد بەجێهێشت. کاتێك ئەوان شارەکەیان بەجێهێشت، ماکان کوڕی کالی گەڕایەوە و لەم کاتەدا بوغرا بۆ جورجان هەڵات و لەگەڵ خەڵکانی ئەو شارە بەشێوەیەکی خراپ هەڵس وکەوتی کرد. ماکان هێرشی کردە سەر و بوغرا بۆ نەیشابور هەڵات و ماکان لەجورجان مایەوە. ئێمە سەرەتای دەرکەوتی ماکان باس دەکەین و بەسەرهاتی کوژرانی ئەو لەساڵی ٣٢٩/٩٤٠ زایینی دەگێڕینەوە.

## شۆرشی ئەلیاس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەسەدی سامانی

ئەلیاس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کەپێشتر باسمان کرد لەگەڵ باوکی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و بۆ فەرغانە هەڵات و لەو شارە مایەوە تا جارێکی دیکە شۆڕشی دەستپێکرد و ئەم جارە داوای هاوکاری لە محەممەد کوڕی حسەین کوڕی مت کرد. ئەو تورکەکانی کۆکردەوە. سی هەزار سوار پەیوەستی بوون. مەبەستی گرتنی سەمەرقەندی کرد و لەگەڵ نەسر کوڕی ئەحمەد ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر. نەسر، باوکی عەمرۆ محەممەد کوڕی ئەسەد و چەند

سەرکردەیەکی دیکەی لەگەڵ دوو هەزار و پێنسەد جەنگاوەر ڕەوانە کرد. ئەوان لەڕۆژی هاتنی ئەلیاس، لەدەرەوەی سەمەرقەند بۆسەیان نایەوە و کاتێك ئەلیاس گەیشت و لەگەڵ سوپاکەی سەرقاڵی دابەزین و ئوردوو لێدان بوون، ئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، لەناو دارەکان هاتنەدەر و شمشێریان خستە ناو سوپاکەی ئەلیاس و ئەلیاس و هاوەڵانی هەڵاتن. ئەلیاس گەیشتە فەرغانە و کوڕی مت خۆی گەیاندە ئەسبیجاب و لەوێوە ڕێگەی تێرازی گرتەبەر. نامەیان بۆ کوێخای تێراز نووسی و تەماحی گرتنی کوڕی مت یان خستەبەردەست. ئەو کوڕی متی گرت و کوشتی و سەرەکەی بۆ بوخارا نارد.

کوڕی مت پیاوێکی بوێر و لەکاتی شۆڕش، چەندین وشتری بەکرێ گرتبوو. وشتردارەکان هاتنەلای و داوای وشترەکانیان کردەوە. وتی: وشترەکانتان لەبەغداد بۆ دەگەڕێنمەوە یانی هیچ شتێك ناداتەوە چوونکە بەهێز و توانای خۆی پشت ئەستور بوو بەلاّم چارەنوس شتێکی جیاوازی بۆ نووسی.

ئەلیاس بۆ سێیەم جار ئالاّی شۆڕشی بەرز کردەوە و ئەم جارە باوکی فەزڵ کوڕی باوکی یوسف، فەرمانڕەوای شاش هاوکاری کرد. محەممەد کوڕی ئەلیەسع بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و دوای جەنگی دوو سوپا، ئەلیاس بۆ کاشغەر هەلاّت و باوکی فەزڵ قۆڵبەست کرا. ئەویان بردە بوخارا و لەوێ مرد.

ئەلیاس کچی ئەمیری کاشغەر تەغانتەکینی وەك هاوسەر هەڵبژارد و لەوێ نیشتەجێ بوو. دواتر محەممەد کوڕی موزەفەر فەرمانڕەوایەتی فەرغانەی گرتەدەست و ئەلیاس کوڕی ئیسحاق بۆ جەنگی ئەوئەسپی غاردا و محەممەد کوڕی موزەفەر ڕووبەڕووی بوویەوە و جارێکی دیکە شکستیدا و ئەلیاس بۆ کاشغەر گەڕایەوە. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی موزەفەر نامەیەکی بۆ نووسی و دڵنەوایی کرد و خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕی. دڵی ئەلیاس ئارام بوویەوە و ڕێگەی بوخارای گرتەبەر و سەعید ڕێزی گرت و کچەکەی کردە هاوسەری ئەو. ئەلیاس لای سەعید مایەوە.

## مردنی محەممەد کوڕی جەریری تەبەری

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی جەریری تەبەری، نووسەری مێژووی تەبەری، لەبەغداد گیانی ئەسپەردە کرد.[٨] ساڵی لەدایك بوونی ئەو ٨٣٨/٢٢٤ زایینی بووە

---

[٨]- مێژووی تەبەری یەكێك لەو كتێبە گرنگانەیە كەكوڕی ئەسیر لەمێژووەكەی خۆیدا پشتی پێ بەستووە بەڵام لەساڵی ٣٠٢ كۆچی بەم لاوە چیتر بوونی نامێنێت و دەبێت تەواوی مێژوو بەبڕواپێكراوترین كتێب كەڕووداوەكانی مێژوویمان بۆ دەگێڕنەوە بزانین و ئەگەری هەیە یەكێك لەلەپێشییەكانی ئەم كتێبە ئەمە بێت.. لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین هەرچەندە كوڕی ئەسیر كەڵكی زۆری لەمێژووی تەبەری بینیوە بەڵام دەبێت بەمێژوویەكی جیاوازی بەروانگەی جیاوازی بزانین بەهەمان شێوە كەتەبەریش لەنووسینی مێژووەكەی خۆی پشتی بەكتێبی وەك فتوح العراق، خبر الجسر، خبر مهران، مقتله یوم النخلیه، خبر القادسیه، المدائن، جلولا، كتاب خبر البصره و فتوحها، خبر الاهواز، خبر السوس، خبر الهرمزان، خبر جندیسابور، خبر رامهرمز و كتێبی فتوحی خوراسان، اختلاف الروایه فی خبر قتیبه بخراسان، كتێبی نوادر قتیبه بن مسلم، كتێبی ولایه اسد بن عەبدولله قسری، كتێبی ولایه نصر بن سیار، كتێبی فتوحی سجستان، كتێبی فارس، كتێبی فتح الابله، كتێبی كرمان، كتێبی فتوح جبال طبرستان، ایام الرشید، كتێبی فتوح جرجان و طبرستان..... بەستووە.

مێژووی كوڕی ئەسیر لەراستیدا خۆی مێژوویەكی گشتگیر و جیاوازە كەنووسەر بەپشت بەستن بەمێژووی تەبەری گشتاندوویەتی و روداوەكانی تا رۆژگاری خۆی درێژەی پێداوە. ئەو بەورد بینی كە لەناو مێژوو نووسانی ئەو سەردەمە بێ وینەیە، دەستی بەهەڵسەنگاندن و نووسینەوەی رووداو و گێڕانەوەكان كردووە و لەوێ كە بۆ یەك رووداو دوو گێڕانەوە لەئارادا بووە و هەڵبژاردنی یەكیان بەدژوار زانیوە، هەردوو گێڕانەوەكەی ئاماژە پێداوە. بەهەرحاڵ تەنانەت لەرووداوەكانی سەرەتای ئیسلام كەسەرچاوەی سەرەكی ئەو مێژووی تەبەری بووە، ورد بینی كوڕی ئەسیر بەرادەیەكە كەكتێبەكەی هەڵگری خاڵە ورد و نەبینراوەكانە و تازەكانە. كوڕی ئەسیر لەبابەتە گونجاوەكان، وەك بارودۆخی كۆمەڵایەتی و باوەڕەكان و ئایینەكان و تەنانەت بەرهەمە ئەدەبییەكان، زانیاری بەسوود بەدەستەوە دەدات هەرچەند لەزۆربەی شوێنەكاندا ئەو سەرچاوانەی پشتی پێ بەستووە، دیاریكراو نییە بەڵام نووسراوەكانی ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت كەكوڕی ئەسیر ئەوپەڕی وردبینی لەهەڵبژاردنی سەرچاوەكان و گێرانەوەكان بەكار بردووە و لەبەر ئەو لەو شوێنەی نازانرێت پشتی بەچ سەرچاوەیەك بەستووە، بەئاسانی دەكرێت پشت بەگێرانەوەكەی ببەسترێت.

كوڕی ئەسیر لەناو هاورۆژگارەكانی خۆی پێگەیەكی تایبەت و بەرزی هەبووە و هەمووان وەسفی لێكۆڵینەوە ورد و قووڵەكانی ئەویان كردووە. كوڕی خەلەكان ئەو ئیمامی حەدیس و شارەزای ئەم زانستە و لقەكانی دەزانێت. كوڕی كەسیر له البدایه و النهایه ئەو بەئیمامی علامه ناو دەبات، زەهەبی جێگەی ئەوە لەلووتكەدا دەزانێت كەخاوەنی چەندین تایبەتمەندی لەپێشە و نوسەری شذرات الذهب ئەو به امام نسابە، مێژوو نووس و ئەدیبێكی دیار ناوزەد دەكات.

كوڕی ئەسیر خۆی نیوەی دووەمی سەدی شەشی كۆچی بینیوە و لەگەڵ پێنج خەلفیە عەباسی هاورۆژگار بووە: مستنجد بالله (٥٥٥-٥٦٦)، مستضی بامرالله (٥٦٦-٥٧٥) ناصر لدین الله (٥٧٥-٦٢٢)، ظاهر بالله (٦٢٢-٦٢٣) و مستنصر بالله (٦٢٣-٦٢٩) كە تا ساڵی ٦٣٠ (ساڵی مردنی كوڕی ئەسیر) هاورۆژگاری ئەم خەلیفەیە بووە.

و شەوانیە لەماڵەکەیدا بەخاك سپێردرا چوونکە خەڵکان کۆبوونەوە و سەرەتا ئەویان بەئیمام و دواتر بەناباوەڕیان لەقەڵەمدا و ڕێگەیان نەدا لەرۆژدا بەخاك بسپێردرێت. عەلی کوڕی عیسا دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر لەم دەستەیە سەبارەت بەئیمامیە و ئیلحاد (ناباوەڕی) پرسیار بکەن، هیچ نازانن.

---

لەماوەی ژیانی کوڕی ئەسیر چەندین گۆڕانکاری سیاسی گەورە ڕوویانداوە کە لەگرنگترینیان ڕووخانی ئەجم ئەلدەولەی سەلجوقی و حکومەتی فاتمییەکان و دامەزراندنی حکومەتی ئەیووبییەکان و هێرشی خاچ پەرەستان بۆ شام و سەرەتای هێرشی تاتارەکان بۆ سەرزەمینەکانی ئسیلامە. لەپاڵ ئەمە، ڕووداوە کۆمەڵایەتی و هزریە نەیارەکان بوونیان هەبووە کە زیاتر بۆتە هۆی پشێوی سیاسی و کۆمەڵگای ئیسلامی بەدەست ئەم ئازارەوە ناڵاندوویەتی. ئەو کێشە و ئاژاوانەی کەس لەداهاتوویان ئاگادار نەبوو و لەم ناوەدا مێژوو نووسێکی وەك کوڕی ئەسیر دەبوا چەندایەتی و چۆنایەتی ئەم ڕووداوانە شی بکاتەوە.

کوڕی ئەسیر لەپێشەکی کتێبەکەی خۆی تایبەتمەندی کارەکانی خۆی بەم شێوەیە باس دەکات:

کاتێك بارودۆخم بەو شێوەیە بینی، دەستم بەنووسینی کتێبێکی مێژووی و گشتگیر سەبارەت بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی پاشاکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و نێوان ئەوان کرد تا بۆمن وەك یادداشتێك بێت لەترسی لەبیرکردن بەردەوام لێی بڕوانم و ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان لەسەرەتای ڕۆژگارەوە ئاماژە پێبدەم. ئەم گێڕانەوە و ڕوداوانە پەیوەست دەبێت و یەکێك ڕێگەی ئەوی دیکە دەبڕێت. ئەم ڕشتەیە تا سەردەمی خۆمان درێژە دەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەیشدا ناڵێم من لەم کتێبەدا هەموو ڕوداوەکانی پەیوەست بەمێژووم باس کردووە چوونکە ئەوەی لەموسڵە (شوێنی ژیان و مانەوەی کوڕی ئەسیر) بەناچاری لەدەستکەوتنی ئەوەی لەقوڵای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە، ناتەوانە بەڵام دەڵێم: لەم کتێبەدا شتێکم کۆکردۆتەوە کە لەهیچ کتێبێکی دیکەدا (بەتەنیا) کۆنەبۆتەوە و هەرکەس لێی بڕوانێت، ڕاستی و دروستی وتەکانی منی بۆ دەسەلمێت و ئەندێشەیەکی جیاوازی نابێت. من کارەکەی خۆم لەکتێبێ گەورەی ئیمام ئەبوو جەعفەری تەبەری دەست پێکرد چوونکە ئەم کتێبە پاڵپشتێکە هەمووان پشتی پێ دەبەستن و لەکاتی دووبەرەکی و جیاوازی، بەڵگەی لێ دەهێننەوە. من هەموو گێڕانەوەکانم لەشوێنی خۆیدا نووسی و دەستکاری هیچم نەکرد. ئەو سەبارەت بەزۆربەی ڕووداوەکان چەندین گێڕانەوەی جیاوازی ئاماژە پێداوە کەهەرکام لەوەی پێشووی گەورەتر یا بچوکترە. هەندێ کات شتێك بەگێڕانەوەی یەکەم زیاد دەکات یا لەوەی دیکە کەم دەکاتەوە. من لەم ناوەدا پشتم بەبڕواپێکراوترین گێڕانەوەی ئەو بەست و گێڕامەوە وکەم و کوڕییەکانم لەشوێنی دیکە پڕ کردەوە. هەر شتێکم لەشوێنی خۆیدا نووسی و لەبەر ئەمە یەك ڕووداو، بەجیاوازی گێڕانەوەکانی، یەکسان و بێ کێشە نووسرایەوە و ئەمە ئەو بابەتەیە لەم کتێبەدا دەیبینن.

کاتێك لەخوێندنەوەی تەبەری تەواو بووم، پشتم بەمێژووە ناودارەکانی دیکە بەست و خوێندمەوە و لەناو ئەوان، ئەوەی لەتەبەری گێڕابوومەوە، گشتگیر و تەوام کرد.، هەرشتێکم لەشوێنی خۆی دانا جگە لەوەی سەبارەت بەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بووە کەهیچم بەوتەکانی ئەبوو جەعفەر زیاد نەکرد مەگەر ئەوەی زیاد کردن پێویست بووبێت یا ئەوەی بێژەرەکەیان بەناڕاست لەقەڵەم دابێت. لەبەر ئەوە پشتم بەتەبەری بەست چوونکە ئیمامێکی قایم کار و لەڕوانگەی زانست و ڕاست باوەڕی، ڕاست کردار. جیاواز لەوە، من لەکتێبە ئاماژە پێدراوەکان، تەنیا پشتم بەو کەسانە بەستووە کەوتارەکانیان ڕاست و لەنووسیندا ڕاست کردار بوون. هەرگیز هاوشێوەی کەسێك نەبووم کە لەتاریکی شەو هەنگاو هەڵبگرێت یا گەوهەر و زیخ تێکەڵ بکات (مێژووی ایران بعد از اسلام، زرین کوب، مقدمه علی شیری بر کامل ابن اثیر، ٦ جلدی. پێشەکی کوڕی ئەسیر)

ئەمە وتەی کوڕی مسکویە، نووسەری تجارب الامم دەڵێت: ئەم پێشەوایە لەم بوختانانە بەدوورە.

ئەوەی دەڵێن خەڵکانی ئاسایی دەمارگیرییان کردووە، وتەیەکی ناراستە و تەنیا دەستەیەك لەحەنبەلییەکان دژایەتی ئەویان دەکرد و کەسانی دیکە شوێنکەوتەی ئەو بوون. ئەم کارەی ئەوانیش هۆکارێکی تایبەتی بوو: ئەوە بوو تەبەری کتێبەکەی خۆی کۆکردەوە کەتیایدا ئاماژەی بەجیاوازی فەقیهەکاندا. هاوشێوەی ئەم کتێبە پێشتر نەنوسرابوو. تەبەری لەم کتێبەدا ئاماژەی بەئەحمەد کوڕی حەنبەل نەکرد. ئەمەیان بیرهێنایەوە و لەوەڵامدا وتی: ئەحمەد کوڕی حەنبەل حەدیس بێژ بوو نەك فەقیە. حەنبەلییەکان ئەمەیان پەسەند نەکرد. ژمارەی حەنبەلییەکانی بەغداد زیاد لەرادە فراوان بوون و لەبەر ئەمە دژی ئەو شۆڕشیان کرد و وتیان ئەوەی دەیانویست.

| | |
|---|---|
| حسدوا الفتی اذ لم ینالوا سعیە | فالناس اعداء له و خصوم |
| کضرائر الحسناء قلن لوجهها | حسدا و بغیا انه لدمیم |

واتاکەی: ئەوان رژدیان بەو پیاوە بەرزە برد، ئەو کاتەی نەیانتوانی دەستدرێژی بکەنە سەر هەوڵەکانی ئەو، بوونە خەڵکانی نەیار و دژومنی ئەو. وەك کوێرەکان کەروخساری ژنێکی جوان لەبەر ئێرەیی بردن بەقێزەون و ناشیرین ناو دەبەن.

من لەوتەی گەورە پیاوان سەبارەت بەتەبەریم بەرادەیەکم وتووە کەپێگەی بەرزی ئەومان بۆ دەستنیشان دەکات. یەکیان وتەی ئیمام ئەبوبەکری وتاربێژە کەدوای ناوبردن لەو کەسانەی تەبەری لەوانی گێڕاوەتەوە یا ئەو کەسانەی لەتەبەرییان گێڕاوەتەوە، دەڵێت: ئەو لەپێشەوا بیرمەندەکانە کە بەپشت بەستن بەوتەکانی ئەو داوەری دەکرا و لەرووناکی مەعریفە و زانستی ئەو، وتەکان دەگێڕدرێنەوە. بەرادەیەك لەزانست بەهرەی بردبوو کە لەناو کەسانی هاوڕۆژگاری خۆی، کەسی هاوتا و هاوشانی ئەو نەدەبینرا. ئەو قورانی لەناو سنگدا بوو، شارەزای خوێندنەوە بوو و ناوەرۆکەکانی بەباشی دەزانی و لەحوکمەکانی قورئان بەقووڵی تێرادەما و لەسونەتەکان و ڕێگەکانی ئاگادار و ڕاست و ناڕاست و ناسخ

و مەنسوخی دەزانی. لەوتەی ئەسحابە و شوێنکەوتەکان و پێشینان لەئەحکامی حەلاڵ و حەرام ئاگادار بوو. لەگەڵ بەسەرهات و گێڕانەوەی خەڵکان ئاشنا و لەمێژووی نەتەوەکان و پاشاکان کتێبێکی بەناوبانگی نووسی. بەهەمان شێوە کتێبێکی لەتفسیردا نووسی کەهاوشێوەی نابینرێت. ئەو لەیاسا و ڕێساکانی فقە چەندین کتێبی نووسی و پشتی بەقسەی فەقیهەکان بەستووە و چەندین بابەتی دیکە کەتەنیا لەو دەگێڕدرێتەوە و لەو زمانی ئەو ئاماژەی پێدراوە.

باوکی ئەحمەد حسەین کوڕی عەلی کوڕی محەممەدی رازی سەبارەت بەو دەڵێت: یەکەم پرسیاری ئیمام ئەبوبەکر کوڕی خوزەیمە لەمن ئەوە بوو: ئایا لەمحەممەد کوڕی جەریری تەبەری شتێکت نووسیوە یا هیچت لەو گێڕاوەتەوە؟ وتم: نە. وتی: بۆ؟ وتم: رووناداتو و حەنبەلییەکان ڕێگە نادەن کەس سەردانی بکات. وتی: خراپت کرد، خۆزگە ئەوەی نوسیوەتە، نەتدەنووسی و تەنیا لەباوکی جەعفەری تەبەریت دەگێڕایەوە.

حسەینەك کەناوی حسەین کوڕی عەلی تەمیمییە، وتی: لەسەرزەوی، کەس بەزاناتر لەباوکی جەعفەری تەبەری نازانم. حەنبەلییەکان ستەمیان لێکرد.

باوکی محەممەد عەبدوللە کوڕی ئەحمەدی فەرغانی دوای ژمارە کردنی نووسراوەکانی تەبەری دەڵێت: ئەبوجەعفەر لەو کەسانە بوو کە لەرێگەی خوا لەسەرکۆنە کردنی هیچ سەرکۆنەکەرێك نەدەترسا و لەزانستی ئاشکرا هیچ کات لەو مافەی خواوەند و موسڵمانان بەڵێنی ئەنجامدانیان لێ سەندبوو، لەترس یا هەر هۆکارێکی دیکە، بەرەو ناڕاستی هەنگاوی هەڵنەدەگرت، هەرچەندە ئازاری فراوانی نەزانەکان و رژدی بەران و ناباوەڕانی پێدەگەیشت.

لەبەرابەردا، باوەڕداران و خۆپارێزەکان بەزانست، لەپێشی، خۆپارێزی و خۆ دوور خستنەوەی ئەو لەدنیا، باوەڕدار بوون. ئەو بەداهاتی کەمی گوندێك لەتەبەرستان کەباوکی وەك میرات بۆی بەجێهێشتبوو، بەسەندەی دەکرد. بەرادەیەك کەسێکی رێزدارە لەم کتێبەدا ناتوانرێت باسی بکرێت.[٩]

---

[٩]- مێژووی تەبەری یەکێکە لەسەرەکیترین و بگرە سەرەکیترین مێژووی بڕواپێکراوی ئیسلام. ئێوەی خوێنەری کوردی زمان لەکاتی خوێندنەوەی ئەم پەرتووکەی بەردەستتان دەتوانن لەهەمان سات خوێنەری ئەو پەرتووکە

## بیرگردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا موقتەدری خەلیفە، یوسف کوڕی باوکی ساجی بەنێوەنجیگەری مونسی خزمەتکار لەزیندان ئازاد کرد. ئەویان بردە لای موقتەدر و خەڵاتی پێبەخشی و ڕەی، قەزوێن، ئەبهەر، زەنجان، ئازەربایەجانی خستە ژێر فەرمانی ئەو. فەرمانی پێدا ساڵانە پێنسەد هەزار دینار بۆ گەنجینە ڕەوانە بکات جگە لەخەرجی سوپاییەکانی ئەو دەڤەرە.

موقتەدر لەم ڕۆژەدا بەوەسیفی بوکتەمەری و تاهیر و یەعقوب دوو کوڕەکەی محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی لەیس خەڵاتی بەخشی.

لەم ساڵەدا یوسف خۆی ئامادە کرد و موقتەدر سوپایەکی بەفەرماندەی وەسیفی بوکتەمەری لەگەڵ نارد و یوسف لەجومادی الاخرە/ سێتامبەر لەبەغدادەوە بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوت. فەرمانی پێدا رێگەکەی لەموسڵەوە هەڵبژێرێت تا بتوانێت لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانی سەرزەمینی رەبیعە بکات. ئەو ڕۆشتە موسڵ و لێکۆڵینەوەی کرد و لەوێوە رێگەی ئازەربایەجانی گرتەبەر و لەم کاتەدا هەواڵی مەرگی کۆیلەکەی(سوبوکی) پێ گەیشت.

لەم ساڵەدا نازوك وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی بەغداد دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا لەمیسرەوە چەندین دیاری گرانبایی بۆ باوکی زەنبور حسەین کوڕی ئەحمەدی مادەرائی گەیشت. لەناو ئەم دیاریانە ئێسترێك دەبینرا کەبێچوویەکی لەگەڵدا بوو (چوونکە ئێستر نەزۆکە و مێچکە ئێستری بێچوودار یەکێك لەشتە سەرسوڕهێنەرەکانە) کەشیری گوانی دایکی دەخوارد. لەناو دیارییەکان هەروەها کۆیلەیەك دەبینرا کەزمانی ئەوەندە درێژ بوو دەیتوانی بیدات لەسەری لوتی.

لەم ساڵەدا موقتەدر، دایکی موسای پێشکاری گرت. هۆکاری گرتنەکەی ئەوە

---

بەنرخەیش بن کەدوای هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆر و تەواو کردنی وەرگێرانی مێژووی تەواو (ئەلکامل فی التاریخ) وەرگێرانی ئەو کتێبە بەنرخە و گرانباییەم دەست پێکردووە و هەنووکە چەندین بەرگی ئەو کتێبە لەکتێبەخانەکاندایە و هیوا دەبرێت لەداهاتوویەکی نزیکدا بەتەواوی بکەوێتە بەردیدەی خوێنەران. (وەرگێر)

بوو دایکی موسا کچی خوشکەکەی خۆی کردە هاوسەری باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی متوەکل عەلی الله. باوکی عەباس قۆز و جوان روخسار بوو و بەکەسێکی جوامێر هەژمار دەکرا. ئەو پاڵێوراوی خەلافەت بوو. کاتێك دایکی موسا پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەست، بەخشش و میوانداری زۆری کرد و سامانەکانی بەفیڕۆدا. دوژمنەکانی دایکی موسا بوختانیان بۆ هەڵبەست و لای موقتەدر خراپەی ئەویان هێنایە سەرزمان و وتیان دایکی موسا بۆ خەلافەتی باوکی عەباس هەوڵ دەدات و سوێندی لەسەرکردەکان وەرگرتووە. سەبارەت بەدایکی موسا قسەی زۆریان بۆ موقتەدر کرد. موقتەدر ئەوی گرت و سامان و گەوهەرە گرانبایییەکانی لێ سەندەوە.

لەم ساڵەدا موسوڵمانان لەوشکی و دەریا جەنگان و تاڵانی زۆریان دەستکەوت و زیان بەکەس نەگەیشت.

لەم ساڵەدا خەڵکانی موسڵ ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و نوێنەری محەممەد کوڕی نەسری پەردەداریان لەشارەکە کوشت. سوپایەك بۆ سەرکوت کردنی ئەوان لەبەغدادەوە بەرەو موسڵ ڕەوانە کرا.

لەجومادی الاخرە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی گەورەی کلکدار لەرۆژهەڵاتەوە بینرا کەدرێژییەکەی لەزەوییەوە دوو گەز بوو.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی نەسری پەردەدار بۆ جەنگ لەموسڵەوە رووی کردە قاڵیقەلا و لەم سنورە رووبەرووی رۆمییەکان بوویەوە و دانیشتوانی تەرسوس خۆیان گەیاندە مەڵتییە و بەم شێوەیە موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و دەستدرێژییان کردە سەر شارەکانی رۆم. ئەم سەرکەوتنە بەشێوەیەك بوو موسوڵمانان تەنانەت خۆیان بیریان لێ نەدەکردەوە. دوای ئەم سەرکەوتنە گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی باوکی محەممەدی یەزیدی، مرد. ئەو زانست لەسەعلەبی و ریاسی فێر ببوو.

ئیسحاق کوڕی عەبدولمەلیکی هاشمی لەم ساڵەدا رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و یانزەی کۆچی ( ٩٢٤ زایینی )

## لابردنی حامید و هاتنە سەرکاری کوڕی فورات

لەرەبیع الاخر/ جولای ئەم ساڵە موقتەدر، حامید کوڕی عەباسی لەوەزارەت و عەلی کوڕی عیسای لەسەرۆکایەتی دیوان لابرد و خەلاّتی بەباوکی حسەین کوڕی فوراتدا و پۆستی وەزارەتی بۆ گەڕاندەوە.

هۆکاری ئەم کارەی موقتەدر ئەوە بوو لەسکالاّی ئەم و ئەو و بەندەکان و کەسانی دەوروبەری خۆی بۆ درەنگ وەرگرتنی رۆژانە بێزار بوو. عەلی کوڕی عیسا بەردەوام رۆژانە و مانگانەی خەڵکانی درەنگ دەدا و کاتێك مانگانەی چەندین مانگ کۆدەبوویەوە، تەنیا بەشێکی دەدا و لەدانی پاشماوەکەی خۆی دوور دەخستەوە. ئەو لەساڵدا دوو مانگ لەموچەی کرێکاران و مووچە خۆرەکانی کەم کردەوە و بەم شێوەیە دوژمنایەتی خەڵکان لەگەڵ ئەو زیادی کرد.

حامید کوڕی عەباس لەمانەوە لەبەغداد بێزار ببوو و جگە لەپۆشینی جل و بەرگی ڕەش هیچی بۆ نەمابوویەوە. حەزی نەدەکرد عەلی کوڕی عیسای لەگەڵدا بێت چوونکە عەلی کوڕی عیسا فەرمانەکانی حامیدی ئەنجام نەدەدا و ئەوی ریسوا دەکرد لەکاتێکدا دەیویست جێبەجێ کردنی هەندێ لەکارەکان لەئەستۆ بگرێت. لەم کاتەدا عەلی کوڕی عیسا دەینوسی: وەزیر زانا، خواوەند بیپارێزێت، فەرمان بدات و جێگری وەزیر ئەنجامی دەدات.

هەرکات یەکێك لەکارگوزارەکانی حامید سکالاّی لەسەر عەلی کوڕی عیسا دەنووسی، حامید لای سکالاّکەی ئەمەی دەنووسی: کارە یاساییەکانی حکومەتی بەجێگری وەزیر سپێردراوە و ئەو دەبێت فەرمان بەفەرمانڕەواکان و کارگوزارەکان بدات تا چیتر ستەم لەمسکێنەکان نەکەن. حامید ویستی بۆ لێکۆڵینەوە ئەو برە پارەی ساڵانە دەبوا بۆ گەنجینە ڕەوانە بکرێت، بەڕەو بەسرە بڕوات. مۆڵەتی ئەم سەفەرەی پێدرا. لەم کاتەدا لەنێوان موفلیحە ڕەش و حامید دەمەبۆڵە کەوتەوە. حامید پێی وت: دەمەوێت سەد کۆیلەی ڕەش پێست بکرم و ناویان بنێم موفلیح و

بەبەندەکانی خۆمی ببەخشم. موفلیح رقی ئەوی لەدڵ گرت و لەبەر ئەوەی لەکەسە نزیکەکانی موقتەدر بوو، لەگەڵ موحسن کوڕی فورات هەوڵیدا باوکی (کوڕی فورات) بۆ وەزارەت بگەڕێنێتەوە و بەڵێنیدا سامانێکی زۆر بەخەلیفە بدات. ئەو بەدەستی خۆی نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی: ئەگەر خەلیفە، وەزیر و عەلی کوڕی عیسا و کوڕی حەواری و شەفیع لۆلۆی و نەسر کوڕی حاجب و دایکی موسای پێشکار و دایکی ئەنیۆن بەو بسپێرێت، حەوت هەزار دینارێان لێ دەستێنێت.

موحسن لەم کاتەدا ئازاد بوو و (چوونکە باوکی لەزینداندا بوو) بەردەوام خراپەی ئەم دەستەی دەهێنایە سەرزمان. کوڕی فورات، موقتەدری لەو بڕە پارەی کوڕی حەواری ساڵانە لەگەنجینە وەری دەگرێت، ئاگادار کردەوە. موقتەدر ئەم بڕەی بەزۆر زانی و لەرەبیع الاخر/ جولای، عەلی کوڕی عیسای گرت وبەزەیدانی پێشکاری سپارد. زەیدان بەبەردەوامی ئەوی لەژوورێکدا ڕاگرت کەکوڕی فوراتی تیا زیندانی بوو. کوڕی فورات لەزیندان هاتەدەر و خەڵاتی وەزارەتی پێبەخشرا. خەڵاتیان بەموحسنی کوڕی بەخشی. ئەمە سێیەم جار بوو کوڕی فورات پێگەی وەزیری بەدەست بێنێت.

باوکی عەلی کوڕی موقلە خراپەی کوڕی فوراتی دەهێنایە سەرزمان و لەرۆژگاری حامید بەشێك لەکارەکانی لەدەستدا بوو. ئەویان بردە لای کوڕی فورات. کوڕی فورات، کوڕی موقلەی بۆ ئەوپێگەیە بەرز کردبوویەوە، ئەوی پەروەردە و چاکەی لەگەڵ کردبوو و باوەڕی نەدەکرد کوڕی موقلە خراپەی ئەو بێنێتە سەرزمان تا ئەوەی کوڕی موقلە خراپەکاری کردە پیشە.

حامید بەرەو واست بەرێکەوت. کوڕی فورات کەسی بەدوای ئەو و هاوەڵانی نارد. دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەویان گرت. حامید ئەمەی بیست و لەبەغداد خۆی شاردەوە و جل و بەرگی خۆپارێزەکانی لەبەر کرد. لەشوێنەکەی هاتەدەر و بەرەو لای نەسری پەردەدار بەرێکەوت و داوای مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووری لێکرد. نەسر مۆڵەتی پێدا و حامید ڕۆشتە ماڵەکەی و داوای لێکرد خەلیفە لەبارودۆخی ئەو ئاگادار بکاتەوە. نەسر موفلیحی خزمەتکاری بانگ کرد و پێی وت: حامید داوای

مۆڵەت دەكات تا بڕواتە لای خەلیفە.

كاتێك موفلیح هات و حامیدی بینی وتی: سلاو لەوەزیری سەروەرمان، كوان ئەو كۆیلە ڕەشانەی ناوت نان موفیلح؟ نەسر داوای لێكرد سەركۆنەی حامید نەكات و وتی: حامید دەخوازێت لەكۆشكی خەلیفە زیندانی بكرێت و تەسلیم بەكوڕی فوراتی نەكەن.

موفلیح ڕۆشتە لای موقتەدر و قسەكانی نەسری پێچەوانە باس كرد. موقتەدر فەرمانیدا حامید بەكوڕی فورات بسپێرن. حامیدیان ناردە لای كوڕی فورات و كوڕی فورات، لەماڵی حەسەنە زیندانی كرد و فەرمانیدا جل و بەرگ و بۆنخۆشكەر و ئەو شتانەی لەكاتی وەزارەت كەڵكی لێوەردەگرت، بخەنە بەردەستی. دواتر ئەو و فەقیە و شارەزاكانی بانگ كرد و لێكۆڵینەوەی خۆی دەستپێكرد و داوای پارەكانی لێكرد. حامید چۆنیەتی پاشەكەوت كردنی هەزار هەزار دیناری ئاشكرا كرد. لەم كاتەدا موحسن كوڕی باوكی حەسەن كوڕی فورات (كوڕی وەزیر) بەڵێنی بەموقتەدر دا پێنسەد هەزار دیناری لێ بستێنێت.، موقتەدر، حامیدی بەموحسن سپارد و موحسن بەچەندین شێوازی جیاواز ئەشكەنجەی كرد و ئەوی لەگەڵ دەستەیەك لەهاوڕێكانی بۆ واست نارد تا زەوییەكانی خۆی لەوێ بفرۆشێت. فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا حامید ژەهر خوارد بكەن. ئەوان هێلكەیەكیان ژەهراوی كرد كەحامید داوای كردبوو. حامید گرفتاری سكچوون بوو و كاتێك گەیشتە واست، تینویەتی تەنگی پێ هەڵچنی (ئاوی جەستەی كەمی كرد). ئەو بەمحەممەد كوڕی بەزوفەری سپێردرابوو. كاتێك محەممەد بارودۆخی ئەوی بینی، قازی و كەسانی كۆكردەوە تا شایەت بن بۆ ئەوەی لەخراپ بوونی بارودۆخی حامید هیچ كارەیە. كاتێك قازی و كەسان گەیشتنە لای حامید، حامید پێی وتن: هاوەڵانی موحسن هێلكەی ژەهراویان دەرخوارددام و من بەم ژەهرە دەمرم و محەممەد لەم كارەدا بێ تاوانە بەلام ئەو چەندین كەل و پەلی گرانبایی لەسامانەكانی من هەڵگرت و دەیخستە ناو پشتییەكی چەرمین و لەبازار بەبەرچاوی خەلیفە ئەمین بەپێنج دینار دەیفرۆشت و كەسێكی بەنوێنەرایەتی خۆی لەبازار رادەسپارد تا بیانكرێت و دواتر بۆی بگەڕێنیتەوە. بەهای ئەم كەل و پەلە سێ هەزار دینار بوو.

بۆ ئەم کارانە شایەت بن.

ئەو کەسەی لێپرسراوی نووسینی ئەم ڕووداوانە بوو، ڕاستییەکانی بۆ موقتەدر نووسی. بەزوفەری لەکردەی خۆی پەشیمان بوویەوە و حامید لەرەمەزان/ دێسامبەری ئەم ساڵە مرد. عەلی کوڕی عیسایان بۆ دانی سێسەد هەزار دینار ناچار کرد. موحسین کوڕی فورات ئەوی بەچەندین شێوازی جۆراوجۆر ئەشکەنجە کرد و شەقەزللەی لەروخساریدا بۆ ئەوەی پارەی لێ بستێنێت بەڵام عەلی کوڕی عیسا هیچ پارەیەکی نەدا.

کوڕی فورات ئاگادار بوویەوە و کردەوەکانی کوڕەکەی بەقێزەون لەقەڵەمدا چوونکە عەلی کوڕی عیسا لەکاتی وەزارەتی خۆی چاکەی لەگەڵ ئەوان کردبوو و لەکاتی بەدبەختی و گرفتاری موحسن دەهەزار دیناری پێدابوو. سەرئەنجام عەلی کوڕی عیسا بەدانی ئەو پارەی داوایان دەکرد، ڕازی بوو. کوڕی فورات ئەوی بۆ مەککە نارد و فەرمانی بەکارگوزاری ئەوشارەدا ئەوی بۆ سەنعا بنێرێت (دووری بخاتەوە) دواتر کوڕی فورات باوکی عەلی کوڕی موقلەی گرت بەڵام ئەوی ئازاد و کوڕی حەواری قۆڵبەست کرد. کوڕی حەواری لەکەسە نزیکەکانی موقتەدر بوو. کوڕی فورات ئەوی بەموحسن سپارد و موحسن ئەشکەنجەی کرد. موحسن کەسێکی بێ ئەدەب، ستەم پیشە و خراپەکار و بێ بەزەیی بوو. خەڵك ئەویان بەگاڵۆی کوڕی پاك (خبيث کورِى طيب) ناو دەبرد. کوڕی حەواری ڕەوانەی ئەهواز کرا تا سامانەکانی لەو شارە زەوت بکەن بەڵام ڕاسپێردر بەرادەیەك ئەشکەنجەی کرد کەگیانی دەرنەبرد.

حسەین کوڕی ئەحمەدی مادەرانی و محەممەد کوڕی عەلی مادەرانیان گرت. حسەین فەرمانڕەوایەتی میسر و شامی دەکرد. دوو هەزار هەزار و حەوتسەد هەزار دیناریان لێ سەندرا. دەستەیەك لەدەبیرەکانیشان قۆڵبەست کرد.

دواتر کوڕی فورات، موقتەدری لەمونسی خزمەتکار ترساند و پێشنیاری پێکرد مونس لەبارەگاکەی خۆی بۆ شام دوور بخاتەوە. موقتەدر بەوتەکەی ڕازی و فەرمانی بەمونسدا بەرەو شام بڕوات. مونس کەدەمێك نەبوو لەجەنگ گەڕابوویەوە، داوای کرد چەند ڕۆژێك کەبۆ کۆتایی ڕەمەزان، دێسامبەر مابوویەوە،

لەویٚ بەسەر ببات. موقتەدر رازی بوو. ئەو رۆژەی مونس بەرەو شام بەرێکەوت، بارانی خەست دەباری.

هۆکاری خراپەکاری کوڕی فورات لەمونس ئەوە بوو کاتێك مونس هات، لەبڕوای موقتەدر بەکوڕی فورات لەزەوت کردنی سامانی خەڵکان و ئەشکەنجە و سزادانی ئەوان لەسەر دەستی کوڕەکەی قسەی دەکرد. لەبەر ئەمە کوڕی فورات لەمونس ترسا و ئەوی لەموقتەدر دوور کردەوە. دواتر کوڕی فورات خراپەی نەسری پەردەداری هێنایە سەرزمان و موقتەدری بۆ زەوت کردنی سامانی ئەو تەماحکار کرد. نەسر پەنای بۆ دایکی موقتەدر برد و دایکی موقتەدر رێگەی نەدا کوڕی فورات زیانی پێبگەیێنێت.

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا باوکی تاهیر سلێمان کوڕی سەعیدی هیجری، مەبەستی بەسرەی کرد و لەگەڵ هەزار و حەوتسەد جەنگاوەر شەوانە گەیشتە بەسرە. ئەو پەیژە دروست کراو لەمووی پێبوو و بەدیواری شارەکەوە هەڵیانواسی و جەنگاوەرەکانی بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوتن و دەروازەکەیان کردەوە و پاسەوانەکانیان کوشت. ئەم پێشهاتە لەمانگی رەبیع الاخر/ جولای روویدا.

بەسرە لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی سوبوکی موفلحی بوو. ئەو تا بەرەبەیان لەم پێشهاتە ئاگادار نەبوویەوە. ئەو نەیدەزانی هێرشبەران قەرەمتین و ئەوانیان بەعەرەبەکان دەزانی. سوبوك هێرشی کردە سەر قەرەمتییەکان و رووبەروویان بوویەوە بەلاّم ئەوان کوشتیان و شمشێریان خستە ناو خەڵکانی بەسرە. خەڵکان بۆ سارا هەلاّتن و قەرەمتییەکان بۆ ماوەی دە رۆژ جەنگان وسەرئەنجام سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی بەسرەیان کوشت. خەڵکان خۆیان دەخستە ناو ئاو و بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆریان خنکان.

باوکی تاهیر حەڤدە رۆژ لەبەسرە مایەوە و تا ئەو جێگەی توانی پارە و کالاّ و ژن و منالّی لەویٚ برد وبۆ شارەکەی خۆی گەڕایەوە. موقتەدر، محەممەد کوڕی عەبدوللەی فارقی وەك کارگوزاری بەسرە دیاریکرد. فارقی کاتێك باوکی تاهیر

شارەکەی بەجێهێشت، بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت.

## زاڵبوونی کوڕی باوکی ساج لەڕەی

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی باوکی ساج لەئازەربایەجانەوە رێگەی ڕەی گرتەبەر. ئەحمەد کوڕی عەلی، برای سەعلوك، رووبەرووی بوویەوە. بەڵام هاوەڵانی هەڵاتن و خۆی لەجەنگەکەدا کوژرا. سەری برای سەعلوك ڕەوانەی بەغداد کرا. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەحمەد کوڕی عەلی لەبراکەی جیاببوویەوە و پەیوەستی موقتەدر ببوو. موقتەدر فەرمانڕەوایەتی ڕەی پێ سپارد بەڵام دواتر یاخیگەری کردە پیشە و لەگەڵ ماکان کوڕی کالی و مناڵەکانی حەسەن کوڕی عەلی ئەتروش کە لەتەبەرستان و جورجان بوون، پەیمانی ئاشتی بەست و سەرپێچی فەرمانەکانی موقتەدری کرد تا ئەوەی سەری گەیشتە بەغداد.

کوڕی فورات بەردەوام خراپەی نەسری پەردەداری دەهێنایە سەرزمان و ئەوی لای موقتەدر بەو کەسە دەناساند کە بەئەحمەد کوڕی عەلی- کە لەنێوان ئەواندا پەیوەندی هاورێیەتی بوو- فەرمانیدا ئاڵای شۆڕش بەرز بکاتەوە.

ئەحمەد کوڕی عەلی لەکۆتایی زیقەعدە/ فەوریە کوژرا و کوڕی باوکی ساج فەرمانڕەوایەتی ڕەی گرتەدەست و لەزیحەججە/ مارسی ئەم ساڵە ڕۆشتە ڕەی و لەسەرەتای ساڵی ٩٢٦/٣١٣ زایینی لەوێوە بەرەو هەمەدان ڕۆشت و کۆیلەکەی، موفلیحی، وەك نوێنەری خۆی لەڕەی بەجێهێشت. دانیشتوانی ڕەی موفلحیان لەشارەکە دەرپەڕاند و ئەو پەیوەستی یوسف بوو. یوسف لەجومادی الاخری ٣١٣/ ٩٢٦ زایینی بۆ ڕەی گەڕایەوە و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مونسی موزەفەر (یاهەمان خزمەتکار) لەسەرزەمینی ڕۆم جەنگی و تالآنی زۆری کۆکردەوە و دەستی بەسەر چەندین قەلآدا گرت. سەمەل لەدەریا جەنگی و هەزار کەسی کوشت و هەشت هەزار چوارپێی دەستکەوت و دووسەد هەزار سەر مەڕی کۆکردەوە و زێڕ و سیمی زۆری تالآن کرد.

لەم ساڵەدا کولە هێرشی کردە سەر عێراق و زەرەر و زیانی زۆری لەکێڵگە و باخەکاندا.

لەم ساڵەدا بەنی کوڕی نەفیس وەك فەرماندەی جەنگی ئیسفەهان دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا بەدری موعتەزیدی لەفارس مرد. ئەو فەرمانڕەوای فارس بوو و دوای ئەوەی مرد، محەممەدی کوڕی جێگەی گرتەوە.

لەم ساڵەدا باوکی محەممەد ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی حسەینی جوریری سۆفی لەگەورە ناودارەکانی سۆفیە و باوکی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی سەری زوجاج (شووشەچی) نەحوی عەرەبی و نووسەری کتێبی معانی القرآن، هەردووك مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و دوانزەی کۆچی ( ٩٢٥ زایینی )

### ڕووداوێکی سەیر

لەم ساڵەدا لەکۆشکی موقتەدر (خەلیفە) پیاوێکی ئێرانی دەرکەوت کەجل و بەرگی گرانبایی لەبەردابوو، لەژێر ئەو جلەدا، جل و بەرگێکی زبری پەشمینی لەبەردابوو کەجەستەی دەهێنایە خوروو. ئەو ئاگرگرە، چقاتە، دەوات، چەقۆ و کاغەز و کیسەیەك ئارد و شەکر و تەنافێکی درێژی پێ بوو. دەوترا ئەوی لەگەڵ پیشەگەران هاتووە. ئەو بۆ ماوەیەك نەبینرا تا ئەوەی بەهۆی تینویەتی هاتەدەر. ئەویان بردە لای کوڕی فورات و کوڕی فورات لەکارەکانی ئەوی پرسی. وتی: تەنیا قسە لەگەڵ خاوەنی ماڵەکە دەکەم. کوڕی فورات خۆشەویستی خۆی نیشاندا بەڵام ئەو هیچی نەوت و دووبارە هەمان وتەی هێنایە سەرزمان: تەنیا لەگەڵ خاوەنی ماڵەکە قسە دەکەم. ئەشکەنجەیان کرد و ئەو هاتە گۆ. وتی: بسم الله، بەخراپە دەستتان پێکرد و بەردەوام ئەم قسەی دەهێنایە سەرزمان، دواتر بەفارسی وتی: نازانم (ندانم، لا ادری). فەرمانی سووتاندنیان دەرکرد.

کوڕی فورات، نەسری پەردەداری بەسەرچاوەی ئەم پێشهاتە زانی چوونکە ئەو پەردەدار بوو. کوڕی فورات، ئەم پێشهاتەی لەبەرچاوی موقتەدر گەورە کرد و وتی نەسری پەردەدار ئەوی شاردبوویەوە بۆ ئەوەی خوێنی موقتەدر بڕێژێت. نەسر وتی: بۆ دەبێت من خوێنی سەروەری باوەڕداران بڕێژم، سەروەرێك کەپێگەی بەرز کردمەوە؟ (چوونکە خۆم هیچ نەبووم) کەسێك دەبێت بۆ کوشتنی خەلیفە هەوڵ بدات کەسامانەکانی لەلایەن خەلیفەوە زەوت کراوە و چەندین ساڵ زیندانی کراوە و زەوییەکانی لێ سەندراوەتەوە. بەم پێیە لەنێوان کوڕی فورات و نەسر دوژمنایەتی ئاشکرا هاتە ئاراوە.

## چۆنیەتی گرفتار بوونی حاجییەکان

لەم ساڵەدا باوکی تاهیر قەرەمتی، لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر هەبیر بۆ ئەوەی لەساڵی ٣١١/٩٢٤ زایینی لەکاتی گەڕانەوەی حاجییەکان لەمەککە هێرشیان بکاتەسەر. ئەو هێرشی کردە سەر کاروانێك کەزۆربەی حاجییەکان لەو کاروانەدا بوون و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی بەغداد و کەسانی دیکە لەناویاندا دەبینران. باوکی تاهیر سامانەکانی ئەوانی تالآن کرد. هەواڵی ئەم تالآن کردنە بەحاجییەکانی دیکە لەفەید گەیشت و ئەوان تا ئەو کاتەی توێشوویان کۆتایی هات، لەوێ مانەوە و دواتر بەخێرایی ملی ڕێگەیان گرتەبەر.

باوکی هەیجا کوڕی حەمدان پێشنیاری پێکردبوون بەرەو وادی ئەلقورا بگەڕێنەوە و لەفەید نەمێنن بەلآم حاجییەکان ئەم ڕێگەیان بەدوور و درێژ زانی و بەوتەکانی رازی نەبوون. باوکی هەیجا ڕێگەی کوفە و ژمارەیەکی زۆری حاجییەکانی لەژێر فەرماندا بوو، کاتێك خواردنیان کۆتایی هات، ڕێگەی کوفەیان گرتەبەر و قەرەمتییەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە و گرفتاریان کردن. باوکی هەیجا و ئەحمەد کوڕی کەشمەرد و نەحریر و ئەحمەد کوڕی بەدریان، مامی دایکی موقتەدر، ئەسیر کرد. باوکی تاهیر هەموو وشترەکانی لەحاجییەکان سەند و ئەوەی لەژن و منداڵ و سامان دەیویست، هەڵیگرت و بۆ هەجەر گەڕایەوە و حاجییەکانی لەوێ ئازاد کرد. زۆربەی حاجییەکان لەتینوێتی و برسیەتی و گەرمای تاقەت پڕوکێن، گیانیان سپارد.

باوکی تاهیر لەو کاتەدا تەنیا بیست و حەوت ساڵ تەمەنی بوو. بەم شێوەیە بارودۆخی پەرێشان و بنەماڵەی ئەسیرەکان و کوژراوەکان لەگەڵ بنەماڵەی ئەو کەسانەی کوڕی فورات دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرتبوو، دەنگیان بەرز کردەوە: قەرەمتی بچوك، باوکی تاهیر، موسوڵمانانی لەڕێگەی مەککە کوشتار کرد و قەرەمتی گەورە، کوڕی فورات، لەبەغداد خوێنی موسوڵمانانی ڕشت.

بارودۆخێکی پەرێشان و قێزەون لەبەغداد هاتە ئاراوە و خەڵکان مینبەری مزگەوتەکانیان شکاند و لەڕۆژی هەینی شەشی سەفەر/ پانزەی مەی، پارچەی

ڕەشیان بەمیحرابەکانەوە هەڵواسی و کوڕی فورات، خۆی دۆڕاند. کوڕی فورات ڕۆشتە بارەگای خەلیفە تا بیر لەرێگە چارەیەك بکاتەوە و راوێژی لەگەڵ نەسری پەردەدار کرد. لەم کاتەدا نەسر زمانی کردەوە و وتی: هەنووکە راوێژمان پێدەکەیت ستوونەکانی حکومەتت لەرزاندووە و بەخوازیار بوون بەپەیوەست بوون بەدوژمنی ئاشکرا بەنامە گۆڕینە و سازان، ناوەوەی حکومەتت ڕزاندووە و بەدوور خستنەوەی مونس و هاوەڵانی ئەو – کەشمشێری حکومەت بوون– دەرەوەت وێران کردووە؟ هەنووکە ئەگەر ئەو پیاوە مەبەستی هێرش کردنە سەر ئێرە بکات، چ کەسێك ڕووبەرووی دەبێتەوە، تۆ یا کوڕەکەت؟ ئێستا دەرکەوت مەبەستی تۆ لەدوور خستنەوەی مونس و کوشتنی من و کەسانی وەك من ئەوە بوو حکومەت لاواز و هێز بەدوژمنان ببەخشیت تا تۆڵەی خۆت لەو کەسانە بکەیتەوە کەدەستیان بەسەر سامانەکانی تۆدا گرتووە. چ کەسێك جگە لەتۆ خەڵکان بەم قەرەمتییە دەسپێرێت چوونکە تۆیش وەك ئەو شوێنکەوتەی شیعەکانیت و ئەوە تۆبوویت ئەو پیاوە ئێرانییە شیعەت هێنایە ئێرە کەیەکێکە لەشوێنکەوتەکانی پیاوی قەرەمتی.

کوڕی فورات سوێندی خوارد نەنامەی بۆ قەرەمتی نووسیوە و نەخوازیاری سازان لەگەڵ ئەوە و تا ئەو کاتە هەرگیز پیاوی ئێرانی نەبینیوە. ئەمە لەکاتێکدا بوو موقتەدر پشتی دەکردە کوڕی فورات. نەسر داوای لەموقتەدر کرد تا مونس و سوپاکەی بانگ بکاتەوە. موقتەدر نامەیەکی بۆ مونس نووسی بگەڕێتەوە. کوڕی فورات هەستا و سوار بەلەمێك بوو. بەردبارانیان کرد و ئەوەندەی نەمابوو لەئاودا بخنکێت.

موقتەدر فەرمانی بەیاقوتدا بۆ بەرگری کردن لەکوفە لەبەرابەر قەرەمتییەکان، بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوێت. یاقوت لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو کوفە بەرێکەوت. دوو کوڕەکەی موزەفەر و محەممەد هاورێیەتیان دەکرد. موقتەدر پارەیەکی زۆری بۆ ئەم سوپایە تەرخان کرد. لەم کاتەدا هەواڵیان پێ گەیشت کەقەرەمتییەکان گەڕاونەتەوە بۆ ناو گەرەك و کۆڵانەکانی خۆیان. یاقوت لەڕۆشتن چاوپۆشی کرد.

مونسی موزەفەر، خزمەتکار گەیشتە بەغداد. کاتێك موحسن کوڕی باوکی فورات هەستی بەڕووخانی خۆی کرد، ئەو زیندانییانەی پارەی زۆری لێ وەرگرتبوون، کوشتی و موقتەدری لێ ئاگادار نەکردەوە چوونکە دەترسا ئەم دەستەیە راستییەکان لای موقتەدر باس بکەن.

## گرتنی کوڕی فورات و موحسنی کوڕی

کوڕی فورات ناوی کەوتە سەرزاران. کوڕی فورات نامەیەکی بۆ موقتەدر نووسی کەخەڵکان بەهۆی خێرخوازی و خۆشەویستی ئەو و وەرگرتنی مافەکانی موقتەدر دوژمنایەتی لەگەڵ دەکەن. موقتەدر کەسی نارده لای و ئارامی کردەوە. کوڕی فورات لەگەڵ کوڕەکەی هاتنە کۆشکی موقتەدر و ڕێزیان لێگیرا. کاتێك ویستیان لەکۆشکەکە بڕۆنەدەر، نەسری پەردەدار ڕێگەی لێگرتن و پاسەوانی بۆ دانان. موفلیح ڕۆشتە لای موقتەدر و داوای لێکرد لابردنی کوڕی فورات دوا بخات. موقتەدر فەرمانیدا و ڕێگەیان بۆ کردنەوە. کوڕی فورات و کوڕەکەی ڕۆشتن. موحسن خۆی شاردەوە بەڵام وەزیر بەیانی تا ئێوارێی بەئەنجامدانی کاروبارەکان بەسەر دەبرد و شەوانە بیری دەکردەوە و لەبەرەبەیاندا لەیەکێك لەخزمەتکارەکانی خۆی بیست:

و اصبح لا يدری و ان كان حازما　　　　　اقدامه خير له ام وراءة

واتاکەی: ئەو شەوی کردە بەیانی و لەگەڵ ئەوەی کەسێکی دوورئەندێش بوو نەیدەزانی، رابردووی باشترە یا پاشەڕۆژی.

بۆ ڕۆژی دواتر، هەشتی ڕەبیع الاوەل/ پانزەی جون، کاتێك خۆر هەڵات، نازوك و بولەیق لەگەڵ ژمارەیەك سەرباز، ڕۆشتنە شوێنی حەوانەوەی وەزیر و ئەویان بەسەر و پێی رووت هێنایەدەر. بولەیق جلی بۆ هاویشت تا خۆی پێ داپۆشێت. ئەویان بە بەلەمێك برد کەمونسی تیا بوو و هیلال کوڕی بەدر هاوڕێیەتی دەکرد. کوڕی فورات داوای بەخشینی کرد و بەشێوەیەکی نەرم دەئاخاوت. مونس پێی وت: هەنووکە من سەروەرم لەکاتێکدا تا دوێنێ خیانەتکار بووم خوازیاری لەناو بردنی حکومەت. تۆ من و هاوەڵانی منت لەرۆژێکی بارانیدا دوور خستەوە و

مۆڵەتت پێنەدام. ئەوی بەشەفیعی لۆلۆی سپارد و ئەو زیندانی کرد. کوڕی فورت ئەم جارە دە مانگ و هەشت ڕۆژ وەزیر بوو. هاوڕێ و منداڵەکانی ئەویان گرت و جگە لەموحسن کەس ڕزگاری نەبوو چوونکە خۆی شاردبوویەوە. نزیکەی هەزار هەزار دیناریان لەکوڕی فورات سەند.

## وەزارەتی باوکی قاسمی خاقانی

کاتێك کوڕی فورات ئەم بەڵای بەسەرهات، عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عوبەیداللە کوڕی یەحیا کوڕی خاقان باوکی قاسم کوڕی باوکی عەلی خاقانی بۆ گەیشتن بەوەزارەت هەوڵەکانی چڕ کردەوە و بەدەستنووسی خۆی بەڵێنیدا لەکوڕی فورات و هاوەڵانی دوو هەزار هەزار دینار بستێنێت. مونس و هارون کوڕی غەریب ئەلخال و نەسری پەردەدار بۆ گەیشتنی ئەو بەوەزارەت هەوڵیان دەدا.

باوکی عەلی خاقانی، باوکی باوکی قاسم نەخۆش بوو و لەبەر تەمەنی زۆر، هۆشی لەدەست دابوو بێ ئەوەی ئاگای لەوەزارەتی کوڕەکەی بێت. باوکی قاسم لەنۆی ڕەبیع الاوەل/ شانزەی جون، وەزارەتی گرتەدەست. موقتەدر خۆشی نەدەویست. کوڕی فورات کاتێك لەزیندان لەم کارە ئاگادار بوویەوە، وتی: ئەوەی بەدبەخت بوو خەلیفەیە نەك من، بەو مانایە کەباوکی قاسم نەزانێکە و هیچ لەکاروباری تایبەت بەوەزارەت نازانێت.

کاتێك باوکی قاسم پێگەی وەزیری بەدەست هێنا، مونسی خزمەتکار بوو بەنێوەنجیگەر تا عەلی کوڕی عیسا لەسەنعا بۆ مەککە بگەڕێنێتەوە. باوکی قاسم نامەیەکی بۆ جەعفەر فەرمانڕەوای یەمەن نووسی و مۆڵەتی پێدا عەلی کوڕی عیسا بۆ مەککە بگەڕێنێتەوە. جەعفەر ئەو کارەی کرد. هەروەها مۆڵەت بەعەلی بەخشرا تا کەنارەکانی میسر و شامی لەژێر دەستا بێت. باوکی عەلی خاقانی لەگەڵ دەستپێکردنی وەزارەتی کوڕەکەی مرد.

## کوژرانی کوڕی فورات و موحسنی کوڕی

موحسن، منالّی کوڕی فوراتی وەزیر،- وەك ئاماژەی پێدرا- خۆی شاردەوە. ئەو لای حەزانەی براژنی بوو. حەزانە دایکی فەزلّ کوڕی جەعفەر کوڕی فوراتە. ئەو رۆژانە موحسنی دەبردە گۆڕستان و شەوانە بەجل و بەرگی ژنان ئەوی دەبردە مالّی یەکێك لەبڕواپێکراوەکانی خۆیان. رۆژێك ئەوی بردە گۆڕستانی قورەیش و شەو داهات و کات لەوە درەنگتر بوو بگەڕێنەوە. ژنێك کە لەگەلّ ئەوان بوو پێشنیاری کرد بڕۆنە مالّی ژنێکی چاکەکار کەدەیناسی بۆ ئەوەی لەوێ خۆی بشارێتەوە. حەزانە، موحسنی بردە مالّی ئەو ژنە و پێی وت کچی (کوڕ نەکراوی) لەگەلّدایە و بەدوای مالّێکدا دەگەڕێن تا شەو بکەنە رۆژ. ژن مۆلّەتی ڕۆشتنە ژووری پێدان و ژوورێکی خستە بەردەستیان. ئەو دوو ژنە موحسنیان بردە ژوورەکە و خۆی لەسەکۆی بەردەم ژوورەکە دانیشتن. لەم کاتەدا کەنیزێکی ڕەش پێست لای ئەو ژوورە تێپەڕی و موحسنی بینی و خاتوونەکەی خۆی ئاگادار کردەوە و پێی وت پیاوێك لەو ژوورەدایە. ژنی مالّەکە هات و ئەوی ناسییەوە.

موحسن هاوسەری ئەم ژنەی گرتبوو تا دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت و کاتێك ئەویان بردبووە زیندان، پیاوێکی بینیبوو چۆن زیندانییەکان ئەشکەنجە و لەت لەت دەکات. کاتێك ژنی مالّەکە موحسنی ناسییەوە، سوار کەشتی بوو و بەرەو کۆشکی خەلیفە بەرێکەوت. کاتێك نزیك کەوتەوە، هاواری کرد: مژدەم بۆ سەروەری باوەڕداران پێیە. نەسری پەردەدار ئەوی بردە لای خۆی و ژنەکە شوێنی مانەوەی موحسنی نیشانی نەسردا. موقتەدر لەم هەوالّە ئاگادار بوویەوە. موقتەدر، فەرمانی بەنازوکی فەرماندەی پاسەوانەکاندا لەگەلّ ژنەکەدا بڕوات و موحسن بگرێت. ژن، نازوکی بردە مالّەکەی خۆی. نازوك ڕۆشتە ناو مالّەکە و موحسنی گرت و بردیە لای موقتەدر. موقتدر ئەوی بۆ مالّی وەزیر نارد و بەچەندین شێوازی جۆراوجۆر ئەشکەنجەیان کرد بەلاّم موحسن رازی نەبوو یەك دینار بدات و وتی: ئەوە رووناداات کەهەم گیانی خۆم بخەمە بەردەستتان و هەم سامانی خۆم. بەرادەیەك ئەشکەنجەیان کرد کەچیتر توانای خواردنی نەمابوو.

کاتێك موقتەدر لەم بارودۆخە ئاگادار بوویەوە، فەرمانیدا ئەو ببەنە لای باوکی لەکۆشکی خەلیفە. باوکی قاسمی وەزیر بەمونس و هارون کوڕی غەریب ئەلخال و نەسری پەردەداری وت: ئەگەر موحسن ببەنە کۆشکی خەلیفە و سامانەکانی خۆی ئاشکرا بکات و موقتەدر بۆ سەندنی سامانەکانی ئێمە تەماحکار بکات و بەڵێنی ئەوە بدات دەست بەسەر سامانی ئێمەدا دەگرێت، ئەوسا ئێمە لەژێر دەستی موحسندا دەبین و ئەمەیش بەواتای مەرگی ئێمە دێت. سەرکردە و سوپاییەکان هان بدەن تا بەخەلیفە بڵێن: دەبێت کوڕی فورات و کوڕەکەی بکوژرێن و تا ئەو کاتەی ئەم دووانە ئازاد و زیندوو بن، ئێمە لەگیانی خۆمان ئاسوودە نین.

لەمبارەوە چەندین نامە نووسرا و مونس و هارون کوڕی غەریب ئەلخال و نەسری پەردەدار پێداگرییان دەکرد لەوەی دەبێت بەداواکاری سوپاییەکان رازی بن. موقتەدر، فەرمانی بەنازوکدا ئەو دوانە بکوژێت. نازوك هاوشێوەی مەڕ سەری بڕین.

کوڕی فورات رۆژی یەکشەممە بەرۆژوو بوو و کاتێك خواردنیان بۆ هێنا، نەیخوارد و کاتێك لەکاتی نوێژی ئێواریْ (کاتی شکاندنی رۆژوو) خواردنیان بۆ برد، دووبارە نەیخوارد و وتی: عەباسی برام لەخەودا بینی کەدەیوت: تۆ و موحسنی کوڕت لەرۆژی دووشەممە لای ئێمە دەبن و بیْ گومان ئێمە دەکوژرێین.

موحسنی کوڕی فورات، لەرۆژی دووشەممەی سیانزەی رەبیع الاوەل/ بیستی جولای کوژرا و سەری ئەویان بۆ لای باوکی نارد. کوڕی فورات ترسا. شمشێریان بۆ ئەویش تیژ کرد. لەم کاتەدا وتی: دەزانم تەنیا شمشێر قسەم لەگەڵ دەکات، دووبارە لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی من بکەن چوونکە سامان و گەوهەری زیاد لەرادە لای من ماوە. پێیان وت: کار لەو قسانەدا نەماوە. ئەویان کوشت لەکاتێکدا ساڵەکانی تەمەنی لەحەفتا و یەك تێپەڕی دەکرد. موحسنی کوڕی سی و سیْ ساڵ بوو. کاتێك باوك و کوڕ کوژران، سەری ئەوانیان بۆ کۆشکی موقتەدر ڕەوانە کرد و موقتەدر فەرمانیدا سەرەکان فرێبدە ناو ئاو.

باوکی حەسەن کوڕی فورات دەیوت: موقتەدر باالله دەمکوژێت. پێشبینی ئەو راست بوو. ئەو لەکاتێکدا نوقمی دەریای بیرکردنەوە و خەمبار بوو، لای موقتەدر

گەڕایەوە. پرسیاریان لێکرد. وتی: لای سەروەری باوەڕداران بووم و داوای هەرچیم کرد، ڕەزامەندی نیشاندا. داوای شتێکم لێکرد و دوای کەمێك داوای شتێکی پێچەوانەم لێکرد. ڕەزامەندی بۆ هەردووکیان نیشاندا. وتیان: ئەمە نیشانەی بڕواپێکراوی تۆ لای خەلیفەیە چوونکە تۆ و وتەکانی تۆ بەراست دەزانێت. کوڕی فورات وتی: سوێند بەخوا بەو شێوە نییە، ئەو گوێ لەهەموو قسەیەك دەگرێت. لەکوێ ئاسوودە بم ئەگەر پێیان وتبێت وەزیرەکەی خۆت بکوژە و ئەو ڕەزامەندی نیشان دابێت. سوێند بەخوا دەمکوژێت.

کاتێك کوڕی فورات کوژرا، غەریب ئەلخال سوار ئەسپ بوو و بەپەلە ڕۆشتە ماڵی خاقانی وەزیر تا ئەم مژدەی پێبدات. خاقانی لەبیستنی ئەم هەواڵە لەهۆش چوو بەشێوەیەك هارون و هاوەڵانی گومانیان کرد مردووە و بنەماڵەکەی شین و ڕۆڕۆیان دەستپێکرد و کاتێك هاتە هۆش، هارون بەجێی نەهێشت تا ئەو کاتەی دوو هەزار دیناری وەك مژدانە لێ سەند.

مونسی موزەفەر بۆ دوو کوڕەکەی دیکەی کوڕی فورات، عەبدوللە و باوکی نەسر – جگە لەموحسن کەکوژرا بوو– نێوەنجیگەری کرد و هەردووکیان ئازاد کران و خەڵاتیان پێ بەخشرا و بیست هەزار دیناریان پێدان بەڵام بیست هەزار دیناریان لەمناڵەکەی دیکەی یانی حەسەن سەند و ئەویان بۆ ماڵەکەی گەڕاندەوە.

کوڕی فوراتی وەزیر، پیاوێکی بەخشندە و شیاو و لەوەڵام و پرسیار خۆش وتار بوو و جگە لەموحسنی کوڕی، بۆ هیچ شتێکی دیکە شیاوی سەرکۆنە کردن نەبوو.

لای ئەو باسی ئەدەیب و حەدیس بێژ و داوێن پاوکان کرا. وتی: من بۆ هاوکاری کردنی ئەوان لەهەموان شیاوترم. فەرمانیدا بەحەدیس بێژەکان بیست هەزار درهەم، بەئەدیبەکان بیست هەزار درهەم، بەفەقیهەکان بیست هەزار درهەم، بەسۆفییەکان بیست هەزار بدەن کەکۆی گشتی کردییە سەد هەزار درهەم.

هەرکات کوڕی فورات دەبووە وەزیر، بەهای سەهۆڵ، مۆم، شەکر و کاغەز بەرز دەبوویەوە چوونکە ئەم کاڵایانە هەم لەکۆشکدا زۆر بەکار دەبران هەم لەلای خەڵکان. کوڕی فورات خاڵی لاوازی نەبوو جگە لەوەی هاوڕێکانی هەرچیان

دەویست، دەیانکرد و ستەمکارییان دەکردە پیشە و ئەو ڕێگەی لێ نەدەگرتن. ڕۆژێك یەکێك لەهاوەڵانی ستەمی لەژنێکی ماڵەکەی کرد. ژن چەندین جار ئەمەی بۆ کوڕی فورات نووسی و گلەیی کرد بەڵام کوڕی فورات وەڵامی نەدایەوە. ڕۆژێك ژنەکە کوڕی فوراتی بینی و پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا گوێ لەوتەکانم بگرە. کوڕی فورات وەستا. ژن وتی: چەندین جار سەبارەت بەو ستەمەی لێم کراوە، نامەم بۆ نووسیویت بەڵام وەڵامت نەداومەتەوە، چتیر دەستم لەتۆ شۆرد و نامەم بۆ خواوەند نووسی. چەند ڕۆژ دوای ئەم وتووێژە بارودۆخی کوڕی فورات گۆڕانی بەسەردا هات و ڕووی کردە هاوەڵانی خۆی و وتی: گومان دەکەم ئەوەی بەسەرم دێت وەڵامی نامەی ئەو ژنە بێت کەبۆ خواوەندی نووسیوە و بەراستیش وابوو (ستەمی ستەم لێکراوان داوێنی ئەوی گرت.)

## زاڵبوونی قەرەمتییەکان لەکوفە

لەم ساڵەدا باوکی تاهیر قەرەمتی هاتە کوفە. هۆکاری هاتنەکەی ئەوە بوو باوکی تاهیر ئەو حاجییانەی ئازاد کرد کەلای ئەو ئەسیر بوون. کوڕی حەمدان و کەسانی دیکە لەناو ئەسیرەکاندا دەبینران. ئەو پەیامی بۆ موقتەدر نارد و دوای لێکرد بەسرە و ئەهوازی پێ بسپێرێت بەڵام موقتەدر وەڵامی نەدایەوە. باوکی تاهیر لەهەجەرەوە هێرشی کردە سەر حاجییەکان.

لەم کاتەدا جەعفەر کوڕی وەرقای شەیبانی فەرمانڕەوای کوفە و ڕێگەی مەککەی لەژێر دەستا بوو. کاتێك حاجییەکان بەرێکەوتن، باوکی جەعفەر لەگەڵ هەزار پیاو لەگەڵ مناڵەکانی شەیبان، لەپێشەوەی ئەوانەوە دەڕۆشت بۆ ئەوەی ڕێگە نەدات باوکی تاهیر زیان لەحاجییەکان بدات. لەدەرباریيەکان وەك سەمەل فەرماندەی هێزی دەریایی جونی سەفوانی و تەریفی سەبکەری و ژمارەیەکی دیکە لەگەڵ شەش هەزار پیاو هاوڕێیەتی جەعفەریان دەکرد. باوکی تاهیر قەرەمتی ڕووبەڕووی جەعفەر بوویەوە. جەعفەر جەنگی دەستپێکرد. لەگەرماوگەرمی ئەم جەنگە لەناکاو دەستەیەك لەقەرەمتییەکان لای ڕاستی گۆڕەپانەکە دەرکەوتن و جەعفەر هەڵات. ئەو لەکاتی هەڵات گەیشتە کاروانی یەکەم

کە لەعەقەبەوە دەهات و هەموویانی لەگەڵ سوپاکەی خەلیفە بۆ کوفە برد. باوکی تاهیر تا دەروازەی کوفە شوێنیان کەوت و جەنگی و سوپاکەی خەلیفە هەڵات و ژمارەیەکیان کوژران و جونی سەفوانی ئەسیر کرا و پاشماوەی کەسان لەگەڵ حاجییەکان لەکوفە هەڵاتن. باوکی تاهیر هاتە ناو کوفە و شەش ڕۆژ لەدەرەوەی شارەکە مایەوە. ئەو ڕۆژانە دەڕۆشتە ناو کوفە و تا شەو لەمزگەوتی گەورەی شارەکە دەمایەوە و شەوی لەئوردووگاکەی خۆی دەکردە ڕۆژ. تا ئەو جێگەی دەیتوانی پارە و سامانی لەکوفە کۆکردەوە و دواتۆ بۆ هەجەر گەڕایەوە.

هەڵاتوان خۆیان گەیاندە بەغداد. موقتەدر، فەرمانی بەمونسی موزەفەردا بەرەو کوفە بڕوات. ئەو بەرەو کوفە بەڕێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەو شارە کەقەرمتییەکان شارەکەیان بەجێهێشتبوو. مونس، یاقوتی وەك نوێنەری خۆی لەکوفە بەجێهێشت و خۆی بەرەو واست ئەسپی غاردا تا ڕێگە نەدا باوکی تاهیر ئەو شارە تاڵان بکات. دانیشتوانی بەغداد ترسان و هەموویان لەبەشی ڕۆژهەڵات کۆبوونەوە (تا ڕووباری دیجلە لەنێوان ئەواندا بێت). لەم ساڵەدا کەس حەجی نەکرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موقتەدر خەڵاتی بەنوجحی تولونیدا و ئەوی کردە فەرمانڕەوای ئیسفەهان.

لەم ساڵەدا نێردراوی پاشای ڕۆم لەگەڵ باوکی عومەر کوڕی عەبد باقی چەندین پێشکەشی گرانباییان هێنایە کۆشکی موقتەدر و داوایان لێکرد کۆتایی بەجەنگ بێنێت و بەئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان ڕازی ببێت. موقتەدر ڕازی بوو دوای جەنگی هاوینە بەداواکارییەکانیان ڕازی ببێت.

لەم ساڵەدا بەجونی سەفوانی دوای گەڕانەوە لەسەرزەمینی میسر، خەڵات بەخشرا.

لەم ساڵەدا خواردەمەنی و کاروباری تایبەت بەجەنگی نەهرەوان بەسەعید کوڕی حەمدان سپێردرا.

لەم ساڵەدا موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر ڕۆم و تالآنییان کرد و ئەسیریان کرد و بێ زیان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەکوفە دەرکەوت کەخۆی بە محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، پێشەوای ئیسماعیلییەکان، دەناساند. ئەو لەخەڵکانی دەوروبەری عێراق و عەرەبە دەشتەکییەکان ژمارەیەکی زۆری کۆکردەوە و لەمانگی شەوال/ دێسامبەر پێگەی بەرز بوویەوە. سوپایەك لەبەغدادەوە بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و ڕووبەرووی بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەو پیاوە هەڵات و ژمارەیەکی زۆر لەسوپا و شوێنکەوتەکانی کوژران.

لەرەبیع الاوەل/ جونی ئەم ساڵە محەممەد کوڕی نەسر پەردەدار کە – وەك ئاماژەی پێدرا– فەرمانڕەوایەتی موسڵی دەکرد، مرد.

لەم ساڵەدا شەفیعی لۆلۆی سەرپەرەستی بەرید کۆچی دوای کرد و شەفیعی موقتەدری جێگەی ئەوی گرتەوە.

## ڕووداوەكانی ساڵی سێسەد و سیانزەی كۆچی ( ٩٢٦ زایینی )

## لابردنی خاقانی لەوەزارەت و هاتنە سەركاری خوسەیبی

لەرەمەزان/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە باوكی قاسمی خاقانی لەوەزارەت دوور خرایەوە.

چۆنیەتییەكەی بەم شێوە بوو: باوكی عەباسی خوسەیبی لەشوێنی مانەوەی هاوسەری موحسن كوڕی فورات ئاگادار بوویەوە و داوای لەموقتەدر كرد كاروباری ئەو ژنە بەو بسپێرێت. موقتەدر بەداواكەی ڕازی بوو. خوسەیبی لەم ژنە حەوتسەد هەزار دیناری وەرگرت و بۆ موقتەدری نارد. خوسەیبی بوو بەهاونشینی موقتەدر و خاقانی لەم پەیوەندییە ترسا. كەسی ڕاسپارد تا خراپەی خوسەیبی لای موقتەدر بێنێتە سەرزمان بەڵام موقتەدر گرنگی بەم وتانە نەدا. كاتێك خوسەیبی لەم بابەتە ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ موقتەدر نووسی و خاڵە لاوازەكانی خاقانی و كوڕەكەی عەبد وەهاب و ناتەوانی ئەم دووانەی نووسی و لەبەفیڕۆ چوونی سەرمایەكان و تەماحكاری كارگوزارەكان دوا.

دواتر خاقانی نەخۆش كەوت و نەخۆشییەكەی درێژەی كێشا و كاروبارەكان كەڵەكە بوون. سوپا داوای مانگانەی خۆی كرد و ئاژاوە دەركەوت. موقتەدر كەسی بۆ لای خاقانی نارد بەڵام وەزیر نەیتوانی هیچ بكات. موقتەدر ئەوی لەسەر كار لابرد و باوكی عەباسی خوسەیبی لەجێگەی ئەو دانا و بەجل و بەرگی وەزارەت ڕازاندییەوە. خاقانی پێشتر دەبیری دایكی موقتەدر بوو و دوای ئەو باوكی یوسف عەبدولرەحمان كوڕی محەممەد وەك دەبیری دایكی موقتەدر هەڵبژێردرا.

باوكی یوسف كاروباری حكومەتی وەلا نابوو و خۆپارێزی كردبووە پیشە. كاتێك ئەم كارەی خرایە سەرشان، خۆپارێزی وەلانا و خەڵكان بەهەڵگەڕاوە لەدین ناویان برد.

كاتێك خوسەیبی وەك وەزیر دەستنیشان كرا، عەلی كوڕی عیسای بۆ سەرپەرەستی كاروبارەكانی میسر و شام هەڵبژارد. عەلی، لەساڵدا چەند جارێك

لەمەککەوە سەردانی ئەو ناوچانەی دەکرد دەگەڕایەوە. خوسەیبی کارگوزاری بۆ هەموو ناوچەکان دیاریکرد و باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسمی کەرخی دوای وەرگرتنی پەنجا و هەشت هەزار دینار وەك سەرپەرەستی موسڵ و دیاری رەبیعە دەستنیشالن کرد.

## سەرکەوتنەکانی خەڵکانی سەقەلییە

لەم ساڵەدا سوپای سەقەلییە لەگەڵ فەرمانڕەواکەی خۆیان سالیم کوڕی راشید بەرێکەوتن. مەهدی (دامەزرێنەری فاتمییەکان) سوپایەکی لەئەفریقییەوە بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد. سالم گەیشتە سەرزەمینی ئەنکبوردە[١٠] و غیران[١١] و ئەبرەجەی[١٢] گرت. ئەوان تالآنی زۆریان دەستکەوت. سوپای سەقەلییە گەڕایەوە و پۆشتە قەلوریە و مەبەستی شاری تارەنتی کرد و گەمارۆی خستەسەر و لەمانگی رەمەزان/ نۆڤەمبەر بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و گەیشتە شاری ئەدرەنت و گەمارۆی خستە سەر ئەو شارەیش و ماڵەکانی وێران و موسوڵمانانی لەبەدبەختی رزگار کرد. سوپای سەقەلییە گەڕایەوە. خەڵکانی سەقەلییە بەردەوام بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر رۆمییەکانی سەقەلییە و قەلوریە و سامانی ئەوانیان تالآن و ماڵەکانیا[illegible]ێران دەکرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا ئیبراهیمی میسعەمی، دەستی بەسەر قوفس لەکەنارەکانی کرمان گرت. ئەو پێنج هەزار کەسی ئەسیر و ئەسیرەکانی بردە فارس و فرۆشتی.

لەم ساڵەدا خورمای تازە بەرادەیەك لەبەغداد زیادی کرد کەوشکیان دەکرد و

---

[١٠]- سەرزەمینێکی بەربلاوە لەسەرزەمینەکانی فەرەنگ لەنێوان کۆنستانتین پۆل و ئاندۆلۆس لەلای دەریای خەلیج و بەدرێژایی کوێستانی قیلال کە لەرۆژهەلاتەوە لەبەرابەر کەنارەکانی مەغریب تێپەر دەبێت و دەگاتە سەرزەمینی قەلوریە (معجم یاقوت)

[١١]– بەعەبرانیش ناوی هاتووە (وەرگێر)

[١٢]– بەئەترەجە و ئەبراجەیش ناوی هاتووە. (وەرگێر)

دەیاننارده واست و بەسره تا ئەو جێگەی دانیشتوانی بەغدادیان بەفیڕۆکار و بەفیرۆدەر ناو برد.[١٣]

لەم ساڵەدا پاشای ڕۆم فەرمانی بۆ سنوور نشینەکان نووسی تا باجی خۆیان ڕەوانە بکەن یا هێرشیان دەکاتە سەر و پیاوەکانیان دەکوژێت و کەسەکانیان ئەسیر دەکات. ئەو لەنامەکەی خۆیدا نووسی: من لەناتەوانی کارگوزارەکەی ئێوە ئاگادارم. سنورنشینەکان گرنگییان بەفەرمانەکانی نەدا. پاشای ڕۆم هێرشی کردنەسەر و سەرزەمینەکانی وێران کرد و لەساڵی ٩٢٧/٣١٤ زایینی هاتە مەڵتییە و ئەو شارەی خاپور کرد و ژمارەیەکی ئەسیر و تالآنی زۆری کۆکردەوە. پاشا شانزە ڕۆژی لەو شارەدا بەسەر برد.

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان لەزوباله ڕێگەیان لەحاجییەکان گرت و سوپای خەلیفە ڕووبەڕوویان بوونەوە بەڵام شکستیان خوارد و قەرەمتییەکان رانەمەڕێکیان لەحاجییەکان سەند و دواتر بەجێیان هێشتن و هێرشیان کردە سەر مەککە.

لەم ساڵەدا لەکاتی هەڵاتنی هەتاو، ئەستێرەیەکی گەورە (بەردی ئاسمانی) کەوتە خوارەوە. دەنگی ئەم ئەستێرە وەك هەورە بروسکە وابوو و هەموو شوێنێکی ڕووناك کردەوە.

لەزیحەجە/ فەوریەی ئەم ساڵەی محەممەد کوڕی کوڕی محەممەد کوڕی سلێمانی باغەندی لەبێژەرانی حەدیس و باوکی عەباس محەممەد کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی میهرانی سەراجی نەیشابوری کەنەوەد و نۆ ساڵ ژیال و لەبیرمەند و کەس خۆپارێزەکان بوو لەگەڵ عەبدولله کوڕی محەممەد کوڕی عەبد عەزیزی بەغەوی کەسەد و دوو ساڵ ژیا و کچەزای ئەحمەد کوڕی مەنبەع بوو، کۆچی دواییان کرد. بەغەوی لەشەوی جەژنی قوربان مرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی محەممەد کوڕی بەشار باوکی حەسەنی خۆپارێز مرد.

---

[١٣]- پەیوەندی خورمای تازە و بەفیرۆدانی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەبەر زۆری خورما شەرابیان لێ دروست دەکرد یا بەهۆی خواردنی خورمای زۆرەوە، پاشەڕۆی ئەوان زیادی دەکرد. وەرگێر.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چواردەی کۆچی ( ٩٢٧ زایینی )

### ڕۆشتنی کوڕی باوکی ساج بۆ واست

لەم ساڵەدا موقتەدر، فەرمانڕەوایەتی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی بەیوسف کوڕی باوکی ساج سپارد و مۆڵەتی پێدا باجی ئەم ناوچانە کۆبکاتەوە و بۆ سەرکردە و سوپاییەکانی خەرجی بکات. موقتەدر فەرمانی پێدا لەڕێگەی ئازەربایەجانەوە بێتە بەغداد تا لەوێوە بۆ واست و دواتر بۆ جەنگی باوکی تاهیری قەرەمتی ڕێگەی هەجەر بگرێتەبەر. ئەو ڕۆشتە واست. لەم کاتەدا واست لەژێر فەرمانی مونسی موزەفەردا بوو. کاتێك یوسف لەواست نزیك کەوتەوە، مونس ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر تا لەوێ بمێنێتەوە. مونس باجی کەنارەکانی هەمەدان، ساوە، قوم، کاشان، بەسرە و کوفە و ماسەبزانی بەیوسف سپارد تا بۆ خەرجییەکانی خۆی کۆی بکاتەوە و لەجەنگ لەگەڵ قەرەمتییەکان کەڵك لەو سامانە ببات. ئەمە ئەندێشەی خوسەیبی وەزیر بوو.

### جەنگی عەبدوللە کوڕی حەمدان لەگەڵ کوردەکان و عەرەبەکان

لەم ساڵەدا کوردەکان و عەرەبەکان، کەنارەکانی مو ، و ڕێگەی خوراسانیان گرت. عەبدوللە کوڕی حەمدان کەخۆی لەبەغداد دەژیا، فەرمانڕەوایەتی ئەم سنورانەی دەکرد. ناسر ئەلدەولەی کوڕی لەموسڵ بوو. باوکی فەرمان نامەیەکی بۆ نووسی تا پیاوەکانی خۆی کۆبکاتەوە و بەرەو تکریت بەرێکەوێت. ناسر ئەلدەولە ئەو کارەی کرد و ڕووی کردە تکریت و لەڕەمەزان/ نۆڤەمبەر گەیشتە ئەو شارە و پەیوەستی باوکی بوو. عەبدوللە عەرەبەکانی کۆکردەوە و دوای ئەوەی ژمارەیەکی کوشتن و ژمارەیەکی سزادا، سامانە تالآن کراوەکانی داوا کرد. کوردەکان و عەرەبەکان بڕێکی زۆر لەسامانە تالآن کراوەکانیان بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە. دواتر عەبدوللە سوپاکەی خۆی بردە شارەزوور و کوردەکانی

جەلالییەی سەرکوت کرد و ڕووبەڕوویان بوویەوە. کەسانی دیکە پەیوەستی عەبدوللە بوون و پێگەی ئەو بەرز بوویەوە. کوردەکان کاتێك پێگەی ئەویان زانی، ملکەچی فەرمانەکانی بوون و دەستیان لەخراپەکاری هەڵگرت.

## لابردنی خوسەیبی و دەستپێکردنی وەزارەتی عەلی کوڕی عیسا

لەزیقەعدە/ ژانویەی ئەم ساڵە موقتەدر، باوکی عەباسی خوسەیبی لەوەزارەت لابرد. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: خوسەیبی وڵاتی گرفتاری تەنگانە و دژواری فراوان کرد و کارەکانی حکومەت لەجووڵە کەوت و پێگەی خوسەیبی لەرزی.

خوسەیبی لەسەرەتای هاتنە سەرکار، هەموو شەوێکی بەمەی خواردنەوە بەسەر دەبرد و بەرەبەیانان مەست لەجێگەکەی هەڵدەستا و چیتر نەکارێکی ئەنجام دەدا نەگوێی لەقسەی کەسێك دەگرت و نامە گەیشتووەکانی دیوانی تا ماوەیەکی دواتر نەدەخوێندەوە و وەڵامی نەدەدانەوە. بەم شێوەیە سامانەکان بەفیڕۆ چوون و بەرژەوەندییەکان نەمان تا ئەو جێگەی خوسەیبی حەزی بەوەزارەت وکارەکانی تایبەت بەوەزارەت نەدەکرد و بەم شێوەیە نوێنەرەکانی بەرژەوەندی وڵات بۆ بەرژەوەندی خۆیان سەریان دەبڕی.

کاتێك بارودۆخ گەیشتە ئێرە، مونسی موزەفەر پێشنیاری لابردنی ئەو و هێنانە سەرکاری عەلی کوڕی عیسای کرد. خوسەیبیان گرت. وەزارەتی ئەو یەك ساڵ و دوو مانگ درێژەی کێشا. کوڕەکەی و هەموو هاورێکانی زیندانی کران و بەیانی ئەو ڕۆژە موقتەدر کەسێکی بەدوای عەلی کوڕی عیسا ڕەوانەی دیمەشق کرد. موقتەدر، فەرمانی بەباوکی قاسم عوبەیدالله کوڕی محەممەدی کەلوزانیدا تا گەیشتنی عەلی کوڕی عیسا بەنوێنەرایەتی ئەو کاروبارەکان راپەڕێنێت. عەلی کوڕی عیسا ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەسەرەتاکانی ساڵی ٩٢٨/٣١٥ زایینی گەیشتە بەغداد و سەرقاڵی ئەنجامدانی کاروبارەکانی وەزارەت بوو. بەردەوام لێکۆڵینەوەی لەکارەکانی وەزارەت دەکرد و بارودۆخ بەرەو چاکبوونەوە دەڕۆشت.

لەبەهێزترین ژێرخانەکانی ئەم پێشکەوتنەوە ئەوە بوو کەخوسەیبی پێرستی ئەو کەسانەی دەبوا سامانیان لێ وەربگیرێت و ناوی ئەو کەسانەی بەڵێنی ئەم

کارەیان دابوو و هەروەها بەڵێنی کارگوزارەکان بۆ کۆکردنەوەی باج لەدەورووبەری عێراق، ئەهواز، فارس، مەغریبی ئامادە کردبوو. عەلی کوڕی عیسا سەیری ئەم پێرستەی کرد و کەسی نارد تا ئەم سامانانە کۆبکاتەوە و بەم شێوەیە بەردەوام پارە دەگەیشتە گەنجینەکەی و ئەو مانگانەکان لەکاتی خۆی دەدا و رۆژانەی سوپاکەی ڕەوانە کرد. ئەو ناوی ئەو کەسانەی کەل و پەلی جەنگیان نەبوو، لەپێرسی سوپاییەکان سڕییەوە، هەروەها ناوی ئەو منداڵنەی باوکیان بەفرت و فێڵ ناویان لەناو پێرستەکاندا نووسیبوو، نەهێشت. هەروەها مانگانەی گۆرانیبێژەکان، قەشمەرەکان، هاونشین و ناتەوان و پیرەکان و ئەو کەسانەی توانای هەڵگرتنی سیلاحیان نەبوو، سڕییەوە. خۆی شەو و رۆژ سەرقاڵی ئەنجامدانی کاروبارەکان بوو و کارگوزارەکانی بۆ ناوچەکان ڕەوانە دەکرد و کەسانی شیاوی هەڵدەبژارد.

موقتەدر فەرمانیدا باوکی عەباسی خوسەیبی بۆ لێکۆڵینەوە بێنن. ئەویان هێنا و فەقیە و قازی و دەبیر و کەسانی دیکەش کۆبوونەوە. عەلی کوڕی عیسا پیاوێك بوو بێ هۆ وتەی نەدەهێنایە سەرزمان. عەلی کوڕی عیسا لەخوسەیبی سەبارەت بەباجی کەنارەکان و شارەکان و وەرگرتنی سامانی ئەو کەسانەی دەبوا، سامانەکانیان دەستی بەسەردا بگیرێت، پرسیاری کرد و باسی باجە کۆنەکراوەکانی هێنایە ئاراوە. خوسەیبی وتی: نازانم. عەلی کوڕی عیسا پێی وت: بۆ یوسف کوڕی باوکی ساجت هێنایە لای خۆت و کەنارەکانی ئیسفەهانت بەو سپارد و چۆن دڵنیابوویت لەوەی ئەو بۆ ئەنجامدانی کارەکانی بەتوانایە لەگەڵ ئەوەی هەموویان لەگەڵ سەرزەمینێکی سەردسێر راهاتبون و نەیاندەتوانی لەسەرزەمینێکی وشك و گەرمەسێر بەرگە بگرن؟ بۆکەسێکت لەگەڵ ئەو نەنارد تا چاودێری خەرجییەکانی سوپاکەی بکات؟ وتی: گومانم دەکرد دەتوانێت رووبەرووی قەرەمتییەکان ببێتەوە و ئەو خۆی رێگەی نەدا کەس وەك چاودێری کارەکانی ڕەوانە بکەم.

عەلی کوڕی عیسا وتی: چۆن لەدین و جوامێری بەڕەوات زانی ناموسی ئەو کەسانەی سامانەکانیان لێ دەستێندرێت، لەناو بچێت و ئەوانت بەهاوەڵانی خۆت

سپارد، کەسانێك کەهاوسەری کوڕی فورات لەناو ئەواندا بوو. ئەگەر ئەوان کارێکی نەشیاویان دەکرد، تۆ خۆت هۆکارەکەی نەبوویت؟ دواتر پرسیاری داهاتی لێکرد و خوسەیبی تێکەڵ و پێکەڵ قسەی دەهێنایە سەرزمان. عەلی کوڕی عیسا پێی وت: تۆ خۆت و سەروەری باوەڕدارانت فریوداوە، ئایا بەسەروەری باوەڕدارانت نەوت من شیاوی وەزارەت نیم؟ ئێرانییەکان هەرکات دەیانویست کەسێك وەك وەزیر دەستنیشان بکەن، سەیری کردەوەکانی ئەویان دەکرد، ئەگەر ئەویان بەکەسێکی دوورئەندێش و خۆپارێز دەبینی، ئەو کارەیان پێ دەسپارد وگەرنە دەیانوت: هەرکەس نەتوانێت کاروباری خۆی راپەڕێنێت، بۆ راپەڕاندانی کاروباری کەسانی دیکە ناتەوان دەبێت. دواتر فەرمانیدا بۆ زیندانی بگەڕێننەوە.

## زاڵبوونی سامانییەکان لەڕەی

کاتێك موقتەدر یوسف کوڕی باوکی ساجی لەواست بانگ کرد، نامەیەکی بۆ سەعید نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی نووسی و ڕەی خستە ژێر فەرمانی ئەو. فەرمانی پێدا بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوێت و ڕەی لەفاتەك، کۆیلەی یوسف، بستێنێت. نەسر کوڕی ئەحمەد بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت و لەسەرەتاکانی ساڵی ٩٢٧/٣١٥ زایینی گەیشتە کێوی قارن (فارن). باوکی نەسری تەبەری ڕێگەی لێگرت. نەسر لەوێ مایەوە و نامەی بۆ تەبەری نووسی و سی هەزار دیناری پێدا تا مۆڵەتی گوزەر کردنی پێبدات. کاتێك لەڕەی نزیك کەوتەوە، فاتەك شارەکەی بەجێهێشت و نەسر کوڕی ئەحمەد لەجومادی الاخرە/ ئۆگۆست فەرمانڕەوایەتی شارەکەی گرتەدەست و دوو مانگ لەوێ مایەوە و سیمجوری دەواتی لەوێ دانا و خۆی گەڕایەوە. دواتر محەممەد کوڕی عەلی کوڕی سەعلوکی وەك کارگوزاری ئەو ناوچەیە دەستنیشان و خۆی بەرەو بوخارا ڕۆشت. سەعلوك هاتە ڕەی و لەسەرەتاکانی شەعبانی ٣١٦/ سێپتامبەری ٩٢٨ زایینی لەوێ مایەوە تا نەخۆش کەوت. ئەو بۆ حەسەنی داعی ماکان کوڕی کالی نامەیەکی نووسی و داوای لێکردن بڕۆنە لای. ئەو، شاری ڕەی بەو دوانە سپارد. ئەو دوانە ڕۆشتنە لای و شارەکەی پێ سپاردن و دواتر لەوێ ڕۆشت و گەیشتە دامغان و لەوێ مرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان بەڵێنی کۆکردنەوەی باجی سەرزەمینەکانی موسڵ، قەردا و بازەبدا و کەنارەکانیدا.

لەم ساڵەدا سەمەل لەبەغداد بەرەو شوێنی کارەکەی خۆی بەرێکەوت.

لەرەبیع الاخر/ جونی ئەم ساڵە، رۆمییەکان بەفەرماندەیی دۆمۆستوق و هاورێیەتی مەلیحی ئەرمەنی، فەرماندەی رێگەکان، هێرشیان کردە سەر مەڵتییە و کەنارەکانی و لەمەڵتییە ئوردوویان لێدا و گەمارۆیان خستە سەر شارەکە. دانیشتوانی مەڵتییە خۆڕاگرییان کرد. رۆمییەکان دەروازەکانی کۆتایی شاریان کردەوە و ڕۆشتنە ناو شارەکە. خەڵکانی شار بەرگرییان کرد و ئەوانیان لەشارەکە دوور کردەوە و هێرشبەران هیچیان لەشارەکە پێنەکرا و تەنیا چەند گوندێکی دەوروبەریان وێران کرد و مردووەکانیان لەناو گۆڕەکان هێنایەدەر و لەت لەتیان کردن. خەڵکانی مەڵتییە بۆ داوا کردنی هاوکاری لەجومادی الاوەل/ جولای مەبەستی بەغدادیان کرد بەلاَم کەس فریایان نەکەوت و بەدەستی خاڵی گەڕانەوە.

خەڵکانی تەرسوس جەنگی هاوینەیان ئەنجامدا و تالاَنی زۆریان لەرۆمییەکان دەستکەوت و گەڕانەوە. لەم ساڵەدا ڕووباری دیجلە لەموسڵەوە بەرەو حەدیسە بەستی بەشێوەیەك چوارپێکان بەسەر سەهۆڵەکەدا دەڕۆشتن.

لەم ساڵەدا باوکی قاسمی خاقانی وەزیر مرد و عەبدوەهابی کوڕی هەلاَت و بۆ شۆردنی باوك و نوێژ خوێندن لەسەر جەنازەکەی ئامادە نەبوو. وەزیر پێش مەرگ لەزیندان ئازاد کرا.

لەم ساڵەدا باوکی تاهیری قەرەمتی هێرشی کردە سەر مەککە و کاتێك خەڵکانی مەککە لەم هێرشە ئاگادار بوونەوە، هەموان لەترسا سامان و بنەماڵەی خۆیان بۆ تائیف برد.

لەم ساڵەدا کەلوزانی نامەیەکی بۆ خوسەیبی – پێش لەسەرکار لابرانی– نووسی کەباوکی تالیبی نەوبەندجانی هاوشێوەی یاخییە خۆسەرەکان هەڵس و کەوت دەکات و دەستی بەسەر زەوییەکانی حکومەتدا گرتووە و دانەوێڵەیەکی زۆری فڕاندووە. باوکی تالبی نەوبەندجانیان هێنا و بۆ ئەم کارەی سەد هەزار دیناریان لێ سەند.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پانزەی کۆچی ( ٩٢٨ )

## سەرەتـای خراپ بوونی پەیوەندی نێوان موقتەدر و مونس

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان کەوتنە جموجۆڵ و مەبەستی هێرش کردنە سەر سنورەکانیان کرد و ڕۆشتنە سەمیسات و سامان و کەرەستەکانی جەنگیان تاڵان کرد و لەکاتی نوێژی نیمەڕۆ لەمزگەوتی هەینی، دەنگی ناقوسیان بەرز کردەوە.

موسوڵمانەکان شوێن ڕۆمییەکان کەوتن و ڕووبەڕوویان بوونەوە و تاڵانی زۆریان دەستکەوت. موقتەدر فەرمانیدا سوپایەك بەفەرماندەیی مونسی موزەفەر ئامادە بکەن و لەرەبیع الاوەل/ جون خەڵاتی فەرماندەیی بەمونس بەخشی. لەکاتی ماڵئاواییدا، مونس لەڕۆشتن بۆ کۆشکی موقتەدر خۆی بەدوور گرت و ترسی ئەو لەموقتەدر ئاشکرا بوو.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی موقتەدر مونسی ئاگادار کردەوە کەموقتەدر فەرمانی بەکۆیلە تایبەتییەکانی خۆی داوە لەناو کۆشك، لەنێوان ئەو و مونس چاڵێك هەڵکەنن و بەبوریا و خۆڵ داپۆشن و هەرکات مونس بۆ ماڵئاوایی لێی نزیك کەوتەوە، بیخەنە ناو چاڵەکە و بیخنکێنن و وانیشان بدەن کەخۆی مردووە. مونس لەڕۆشتن بۆ ناو کۆشك خۆی بەدوور گرت و هەموو سوپاییەکان و لەناو ئەوان عەبدوللە کوڕی حەمدان و براکانی ئەو لەکۆشك هاتنەدەر تا ئەو جێگەی کۆشك کەسی تیا نەما. ئەوان بەمونسیان وت: ئێمە شان بەشانی تۆ دەجەنگین تا ئەو کاتەی ڕیشی تۆ بڕوێت.[١٤] موقتەدر بەخەتی خۆی نامەیەکی بۆ مونسی نوسی و سوێندی خوارد ئەو هەواڵەی پێی گەیشتووە، ناڕاستە. مونس سوپاکەی ئامادە کرد و وەڵامی موقتەدر نووسی و خۆی بەبەندەی ئەو لەقەڵەمدا و نووسی: ئەو کەسەی ئەم هەواڵەی بەو داوە، بوختانی هەڵبەستووە و مەبەستی ئەوە بووە ئەو لەسەرورەری خۆی دوور بکاتەوە و ئەوەی

---

[١٤]- مانای ئەم رستەیە بەتەواوی روون نییە یا بەو واتایە کەتا زیندوویت و ڕیشی تۆ دەڕوێت، لەگەڵ تۆداین یا مونس کۆسە بووە و ڕیشی لێ نەهاتووە و ئەم نیشانەی وەفاداری ئەوان بۆ مونسە. وەرگێر.

کەئەو سوپای بانگ نەکردووە و سوپا خۆی لەدەوری ئەو کۆبوونەتەوە و ئەو (مونس) بلاوەی پێکردوون.

دواتر مونس لەگەڵ ژمارەیەك لەسەرکردەکان مەبەستی ڕۆشتن بۆ کۆشکی موقتەدری کرد و ڕۆشتنە ناو کۆشك. دەستی خەلیفەی ماچ کرد و لای خەلیفە سوێندی خوارد هیچ کینەیەکی لەدڵدا نییە و ماڵئاوایی لەخەلیفە کرد و لەدەیەی کۆتایی رەبیع الاخر/ جون بەرەو سنورەکان بەرێکەوت. باوکی عەباس کوڕی موقتەدر یا هەمان راضی الله و عەلی کوڕی عیسای وەزیر ماڵئاواییان لێکرد.

## گەیشتنی قەرەمتییەکان بەعێراق و کوژرانی یوسف کوڕی باوکی ساج

لەم ساڵەدا هەواڵ گەیشت کەباوکی تاهیری قەرەمتی لەهەجەرەوە بەرەو کوفە دەڕوات. دواتر هەواڵێك لەبەسرەوە گەیشت کەسوپای قەرەمتی لەکەنار بەسرەوە بەرەو کوفە بەرێکەوت. موقتەدر نامەیەکی بۆ یوسف کوڕی باوکی ساج نووسی و لەم پێشهاتانە ئاگاداری کردەوە و فەرمانی پێدا بەرەو کوفە ئەسپ غار بدات. یوسف لەکۆتایی رەمەزان/ بیست و نۆی نۆڤەمبەر لەواستەوە بەرەو کوفە بەرێکەوت. لەکوفە هێز و توانا و توێشو بۆخۆی و سوپاکەی ئامادە کرابوو بەلام کاتێك باوکی تاهیری قەرەمتی گەیشتە کوفە، کارگوزارانی حکومەت هەلاتن و باوکی تاهیر دەستی بەسەر کوفەدا گرت و هەموو توێشو و ئالیکەکانی شارەکەی تالان کرد. لەو کاتەدا سەد کوڕ (کر)[١٥] ئارد و هەزار کوڕ جۆ لەکوفەدا بوو. باوکی تاهیر کەخواردەمەنی و توێشوی کۆتایی پێ هاتبوو، بەهۆی ئەوانەوە هێز و توانای خۆی بەدەست هێنایەوە.

یوسف کوڕی باوکی ساج رۆژێك دوای باوکی تاهیر گەیشتە کوفە. ئەو لەرۆژی هەینی هەشتی شەوال/ هەشتی دیسامبەر گەیشتە کوفە. پەیکی بۆ لای باوکی تاهیر نارد و پێشنیاری فەرمانبەری فەرمانەکانی خەلیفە موقتەدری پێکرد و پەیامیدا ئەگەر سەرپێچی بکات، رۆژی یەکشەممە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەوان

---

[١٥]- هەر کرێك ١٠٩٠٠ مسقاڵە. وەرگێر

وەڵامیان دایەوە: تەنیا ملکەچی فەرمانەکانی خواوەندین و بەیانی بەرەبەیان کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێمەیە.

بۆ بەیانی، سەرەسەرییەکانی سوپاکەی باوکی تاهیر جەنگیان بەشەڕە بەرد و جوێندان دەست پێکرد. کاتێك یوسف کوڕی باوکی ساج ژمارەی قەرەمتییەکانی بەکەم بینی، بەکەم بەها سەیری کردن و وتی: ئەم سەگانە کاژێرێکی دیکە لەژێر دەستی مندا دەبن و فەرمانیدا بۆ ڕیسوا کردنی ئەوان پێش جەنگ نامە و مژدەی سەرکەوتن بنوسن.

دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. لەم کاتەدا باوکی تاهیر دەنگی کەڕەنا و هاواری بیست. لەکەسی تەنیشت خۆی پرسی: ئەم دەنگە چییە؟ وتی: تێکشکاون. باوکی تاهیر وتی: بەو شێوەیە و هیچی دیکەی نەوت. دوو سوپا ڕۆژی شەممە لەبەرەبەیانەوە تا ئێواریٚ جەنگان و هەردوولا خۆڕاگرییان کرد. کاتێك باوکی تاهیر بارودۆخی بەم شێوە بینی، خۆی لەگەڵ ژمارەیەك لەکەسە بڕواپێکراوەکانی شمشێری دەرکێشا و هێرشی کردە سەر دوژمن و هاوەڵانی یوسفی بریندار کرد و و بەهەڵاتن و پاشەکشیٚ ناچاری کردن و یوسف کوڕی باوکی ساج و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد. یوسف لەکاتی ئاوابوونی هەتاو ئەسیر کرا. ئەویان بردە ئوردووگای قەرەمتییەکان و باوکی تاهیر پزیشکێکی هێنا تا برینەکانی تیمار بکات.

هەواڵی سەرکەوتنی قەرەمتییەکان گەیشتە بەغداد و هەمووان ترسی قەرەمتییەکانیان کەوتە دڵەوە و مەبەستی هەڵاتن بۆ حیلوان و هەمەدانیان کرد. هەڵاتووان کەزۆربەیان پیادە و پیٚ پەتی و بیٚ جل و بەرگ بوون، گەیشتنە بەغداد. مونس هاتە پێش تا بەرەو کوفە بڕوات بەڵام ئاگادار بوویەوە قەرەمتییەکان بەرەو عەین ئەلتەمەر بەرێکەوتوون. ئەو لەبەغداد پێنسەد کەشتی لێوانلێو لەجەنگاوەران کرد و ڕەوانەی کردن تا ڕێگر بن لەپەڕینەوەی باوکی تاهیر لەفورات. ئەو دەستەیەکی بۆ ئەنبار ڕەوانە کرد تا پارێزگاری ئەو شارە بکەن و ڕێگە نەدەن قەرەمتییەکان بڕۆنە ناو شارەکە.

قەرەمتییەکان مەبەستی ئەنباریان کرد بەڵام دانیشتوانی شارەکە پردەکەیان

بڕی و قەرەمتییەکان لەرۆژئاوای فورات ئوردوویان لێدا و باوکی تاهیر هاوەڵانی خۆی بۆ حەدیسە نارد. ئەوان لەحەدیسە چەند کەشتییەکیان لەگەڵ خۆیان هێنا بێ ئەوەی دانیشتوانی ئەنبار لەم پێشهاتە ئاگادار بن. بەم شێوەیە سێسەد پیاو لەقەرەمتییەکان لەرووبار پەڕینەوە و گەیشتنە ئەنبار و رووبەرووی سوپای خەلیفە بوونەوە و بەهەڵاتن ناچاریان کردن و دەستەیەك لەوانیان کوشت. قەرەمتییەکان دەستیان بەسەر ئەنباردا گرت و دووبارە پردەکەیان هەڵبەستەوە. باوکی تاهیر بەخێرایی لەپردەکە گوزەری کرد و باروبنەی خۆی لەبەشی رۆژئاوا دانا.

کاتێك هەواڵی گەیشتنی باوکی تاهیر بەئەنبار گەیشت، نەسری پەردەدار لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوت وپەیوەستی مونسی موزەفەر بوو. ژمارەی هەردوو سوپاکە لەسەر یەك چل وچەند هەزار جەنگاوەر بوو جگە لەو کۆیلە و کەسانەی تەنیا بۆ کۆکردنەوەی تالاّنی بەرێکەوتبوون. باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان و براکانی ئەو باوکی وەلید و باوکی سەرایا و کەسەکانیان لەناو سوپاکەی نەسردا دەبینران. سوپا رێگەی بڕی و گەیشتە رووباری زەبارا (زیار) لەدوو فەرسەخی بەغداد لەعەقەرقوف. باوکی هەیجا فەرمانیدا پردەکە بپچڕێنن و ئەو کارەیان کرد. باوکی تاهیر و سوپاکەی هێرشیان کردە سەر سوپاکەی نەسر و گەیشتنە رووباری زەبارا. پێشەنگی باوکی تاهیر کە لەپێشەوە ڕێگەی دەبڕی، ڕەش پێستێك بوو. کاتێك لەپردەکە نزیك دەکەوتەوە، تیرەکان رێگر نەبوون لەپێشڕەوی ئەو تا ئەوەی خۆی گەیاندە پردەکە و بینی پچڕاوە. ئەو گەڕایەوە لەکاتێکدا لەبەر زۆری ئەو تیرانەی لەجەستەی چەقیبوون، لەژیشك دەچوو.

قەرەمتییەکان هەوڵیاندا لەرووبارەکە بپەڕنەوە بەڵام نەیانتوانی چوونکە ئەو بەشەی رووبار شوێنی پەڕینەوەی نەبوو. کاتێك سوپای باوکی تاهیر لەسوپای خەلیفە نزیك بوویەوە، ژمارەیەك لەسوپای خەلیفە بێ ئەوەی جەنگ روویدات، بەرەو بەغداد هەڵاتن. کوڕی حەمدان کاتێك ئەمەی بینی، بەمونسی وت: ئەوەی سەبارەت بەو بەتۆم وت، چۆنی دەبینی. سوێند بەخوا ئەگەر قەرەمتییەکان لەرووبار بپەڕنەوە، هەموو سوپاکەی تۆ هەڵدێت و ئەوان دەست بەسەر بەغداد

دەگرن. کاتێك قەرەمتییەکان بارودۆخیان بەم شێوەیە بینی، بۆ ئەنبار گەڕانەوە. مونسی موزەفەر هاورێکەی خۆی بولەیقی لەگەڵ شەش هەزار جەنگاوەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای قەرەمتییەکان لەرۆژئاوا فورات ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی ئوردووگاکەیان تالآن و کوڕی باوکی ساج ڕزگار بکات. ئەم دەستەیە پێیان گەیشتنەوە لەکاتێکدا باوکی تاهیر سوار لەسەر بەلەم لەڕووباری فورات پەڕیبوویەوە. ئەو بە بەلەم ئاژۆکە دەهەزار دیناریدا. کاتێك هاوەڵانی ئەمەیان بینی، دڵگەرم بوون. کاتێك سوپاکەی مونس هات، باوکی تاهیر لەناو سەربازەکانی خۆی لەوبەری فورات بوو. شەڕێکی قورس دەستپێکرد و سوپاکەی خەلیفە هەڵات.

باوکی تاهیر سەیری کوڕی باوکی ساجی دەکرد کە لەخێوەتەکەی هاتبووە دەر و سەیری هەموو لایەکی دەکرد بۆ ئەوەی خۆی رزگار بکات. هاوەڵانی هاواریان دەکرد: مژدەی سەرکەوتنت لێ بێت. کاتێك سوپای خەلیفە شکستی خوارد، باوکی تاهیر، یوسف کوڕی باوکی ساجی هێنا و کوشتی. باوکی تاهیر هەموو ئەسیرەکانی سەربڕی. بەغداد لەتالآن کردن بەهۆی ئاژاوە چییەکانەوە پارێزراو بوو چوونکە نازوك و پاسەوانەکان شەو و رۆژ کێشکیان دەگرت و ئەگەر دوای تاریك بوونی هەوا، کەسێکیان دەبینی، دەیانکوشت. بەم شێوەیە تالآنچییەکان بیریان لەتالآن کردنی شارەکە نەکردەوە. ژمارەیەك لەدانیشتوانی بەغداد بەلەمیان بەکرێ گرت و سامانی خۆیان دەخستە ناو بەلەمەکان و بەرەو واست بەرێدەکەوتن. دەستەیەك کالآکانی خۆیان بردە واست و حیلوان بۆ ئەوەی رێگەی خوراسان بگرنەبەر. ژمارەی قەرەمتییەکان هەزار و پێنسەد کەس بوو، حەوتسەد سوار و هەشتسەد پیادە. دەستەیەك ژمارەی ئەوان بەدوو هەزار و حەوتسەد کەس دەزانن.

قەرەمتییەکان مەبەستی شاری هەیتیان کرد و موقتەدر، سەعید کوڕی حەمدان و هارون کوڕی غەریبی بۆ ئەو دەڤەرە ڕەوانە کرد. کاتێك قەرەمتییەکان گەیشتنە ئەو شارە، سوپای خەلیفەیان بینی کەپێش ئەوان گەیشتبوونە ئەوێ. لەسەر گرتنی دیوارەکە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سوپای خەلیفە توانی ژمارەیەکی زۆر

لەقەرەمتییەکان بکوژێت. قەرەمتییەکان ئەو ناوچەیان بەجێهێشت.

کاتێك هەواڵی گەڕانەوەی قەرەمتییەکان لەشاری هەیت گەیشتە دانیشتوانی بەغداد، ئاسوودە و ئەرخەیان بوون. کاتێك موقتەدر لەژمارەی سوپاکەی خۆی و قەرەمتییەکان ئاگادار بوویەوە، وتی: نفرینی خواوەند لەهەشتا و چەند هەزار جەنگاوەر کە لەشکستدانی دوو هەزار کەس ناتەوانن.

کەسێك هاتە لای عەلی کوڕی عیسا و ئاگاداری کردەوە کەیەکێك لەهاوسێکانی ئەو پیاوێکی شیرازییە و شوێنکەوتەی ئایینی قەرەمتییەکانە و سیخوڕی بۆ باوکی تاهیر دەکات. عەلی کوڕی عیسا بانگی کرد و لێی پرسییەوە. ئەو راستییەکانی هێنایە سەرزمان و وتی: من باوکی تاهیرم نەبینیوە بەڵام گومانم نییە کە ئەو لەسەر رێگەی راستە و تۆ هاوەڵانت کافرانێکن کەئەوەی لەئێمەی وەردەگرن، تایبەت بەئێوە نییە و خواوەند دەبێت لەسەر زەوی بەڵگەیەکی هەبێت و پێشەوای ئێمە مەهدی محەممەد کوڕی فلاّن کوڕی فیسار کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جەعفەری سادقە و لەمەغریب ژیان بەسەر دەبات. ئێمە هاوشێوەی رافضە و دوانزە ئیمامی نین کە لەبەر نەزانی چاوەڕوانی کەسێکن و بەدرۆ بەیەك دەڵێن ئەویان بینیوە و بیستوویانە کەقورئانی خوێندووە و لەبەر نەزانی و کەم ئەزمونی نازانن کەس ناتوانێت خاوەنی ئەو تەمەنە بێت کەباسی دەکەن. وەزیر پێی وت: تۆ تێکەڵ بەسوپاکەی ئێمە بوویت و دەیانناسیت، کام یەك لەوان شوێنکەوتەی ئایینەکەی تۆن؟ وتی: تۆ بەم ئاوزەوە کاروباری وەزارەت رادەپەڕێنیت؟ چۆن چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت من ژمارەیەك خواناس بەکەسێکی خوانەناس بسپێرم تا خوێنیان برێژێت. ئەو کارە ناکەم. وەزیر فەرمانی ئەشکەنجە کردنی ئەوی دەرکرد و رێگەی خواردن و خواردنەوەیان لێگرت و سێ رۆژ دواتر مرد.

کوڕی باوکی ساج پێش جەنگ لەگەڵ قەرەمتییەکان نوێنەری خۆی محەممەد کوڕی خەلەف نەیرەمانی گرت و باوکی عەلی حەسەن کوڕی هارونی لەجێگەی ئەو دانا و پێنسەد هەزار دیناری لەمحەممەد سەند. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: نەیرەمانی پێگەی بەرز بوویەوە و سامانەکەی زیادی کرد و چاوی تەماحی بڕییە

وەزارەت. نامەیەکی بۆ نەسری پەردەدار نووسی و داوای وەزارەتی کرد و خراپەی کوڕی باوکی ساجی هێنایە سەرزمان و وتی: ئەو کەسێکی قەرەمتییە و باوەڕی بەپێشەوایی پیاوی عەلەوی هەیە کە لەئەفریقییە دەژیت و من چەندین جار لەمبارەوە گفتوگۆم لەگەڵ کردووە بەڵام ئامادە نییە دەست لەئایینەکەی خۆی هەڵگرێت و بۆ جەنگ لەگەڵ باوکی تاهیری قەرەمتی نەهاتە گۆڕەپانی جەنگ و پارەکانی کۆکردەوە و خۆی بەهێز کردووە و مەبەستی رووخاندنی خەلافەتی منداڵەکانی عەباسی لەسەردایە. نەیرەمانی قسەکانی خۆی گەورە کرد.

محەممەد کوڕی خەلەف لەناو هاوەڵانی یوسف کوڕی باوکی ساج چەندین دوژمنی بوو چوونکە خراپەی لەگەڵ کردبوون. ئەوانیش تۆمەتیان بۆ هەڵبەست و یوسف کوڕی باوکی ساجیان لەوتە و بوختان و کارەکان و ئەو نامانەی بۆ بەغدادی ناردووە، ئاگادار کردەوە. لەم ناوەدا چەندین نیشانە دانرابوون کەنیشانەکان ناسرانەوە و تیایدا مژدەی وەزارەتی ئەو و لابردنی عەلی کوڕی عیسا ئاماژەی پێدرابوو. کوڕی باوکی ساج کاتێك لەم کەین و بەینە ئاگادار بوویەوە، محەممەد کوڕی خەلەفی گرت. کاتێك کوڕی باوکی ساج ئەسیر کرا، محەممەد لەزیندان رزگاری بوو. کوڕی باوکی ساجیان بەشێخی کەریم ناو دەبرد لەبەر ئەو رێز و پێگەی خواوەند پێی بەخشیبوو.

## زاڵبوونی ئەسفار لەجورجان

لەم ساڵەدا ئەسفار کوڕی شیرویەی دەیلەمی دەستی بەسەر جورجاندا گرت. لەسەرەتا، ئەوی بەیەکێك لەهاوەڵانی ماکان کوڕی کالی دەیلەمی هەژمار دەکرا و کەسێکی توند و تیژ و خراپەکار بوو. ماکان ئەوی لەسوپاکەی خۆی دەرکرد و ئەو، پەیوەستی بەکر کوڕی محەممەد کوڕی یسەع لەنەیشابوور بوو. خزمەتی ئەوی دەکرد. بەکر کوڕی محەممەد ئەوی بۆ جورجان نارد تا دەست بەسەر ئەو دیارەدا بگرێت.

لەم کاتەدا ماکان کوڕی کالی لەتەبەرستان بوو وبراکەی باوکی حەسەن کوڕی کالی لەجورجان. ئەو، باوکی عەلی کوڕی باوکی حسەینی ئەتروشی عەلەوی لای

خۆی زیندانی کردبوو. شەوێك باوکی حەسەن لەگەڵ هاونشینەکانی خۆی مەی دەخواردەوە و دواتر مۆڵەتی ڕۆشتنی پێدان و تەنیا پیاوی عەلەوی لەماڵەکەیدا مایەوە. باوکی حەسەن شمشێرەکەی هەڵگرت و بەرەو لای پیاوی عەلەوی ڕۆشت تا بیکوژێت. بەڵام پیاوی عەلەوی بەسەریدا سەرکەوت و گیانی گرت و لەماڵەکەی ڕۆشتەدەر و خۆی شاردەوە. بۆ بەرەبەیان، عەلەوی پەیکی بۆ لای دەستەیەك لەسەرکردەکان نارد و لەبەسەرهاتەکەی خۆی ئاگاداری کردنەوە. ئەوان لەکوژرانی باوکی حەسەن کوڕی کالی شادمان بوون و عەلەوییان هێنایە لای خۆیان و تاجیان خستەسەر و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد و بەم شێوەیە ئەو شەو ئەسیر بوو و بەیانی ئەمیر. ئەو، عەلی کوڕی خەرشیدی وەك فەرماندەی سوپاکەی هەڵبژارد و سوپاییەکان ڕەزامەندی خۆیان بەم هەڵبژاردنە نیشاندا. دواتر لەگەڵ ئەسفار کوڕی شیرویە نامەیان گۆڕییەوە و ئەویان لەبارودۆخی خۆیان ئاگادار کردەوە و بانگیان کرد. ئەو لەبەکر کوڕی محەممەد مۆڵەتی وەرگرت و بەرەو جورجان بەرێکەوت و لەگەڵ عەلی کوڕی خەرشید یەکی گرت و هەردووکیان پێکەوە کاروباری ئەو سەرزەمینەیان ڕادەپەڕاند. ماکان کوڕی کالی لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەتەبەرستانەوە بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێکەوت. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سوپای عەلەوی شکستی بەسوپاکەی کالی هێنا و ئەویان لەتەبەرستان دەرپەڕاند و لەگەڵ عەلەوی لەوێ مانەوە. ڕۆژێك پیاوی عەلەوی سەرقاڵی یاری چۆگان بوو کە لەئەسپەکەی کەوتە خوار و مرد.

دوای ماوەیەك عەلی کوڕی خەرشید، فەرماندەی سوپا، مرد و ماکان کوڕی کالی بۆ جەنگی ئەسفار گەڕایەوە و ئەسفار شکستی خوارد و بۆ لای بەکر کوڕی محەممەد کوڕی یەسەع لەجورجان هەڵات و لەوێ مایەوە تا مردنی بەکر و لەساڵی ٩٢٨/٣١٥ زایینی ئەمیر سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد، ئەو سەرزەمینە خستە ژێر فەرمانی ئەسفار. ئەسفار مەرداویج کوڕی جیلی بۆ بارەگای خۆی بانگ کرد و ئەو خۆی گەیاند. ئەسفار ئەوی وەك فەرماندەی سوپاکەی هەڵبژارد وچاکەی لەگەڵ کرد. دواتر مەبەستی هێرش کردنە سەر تەبەرستانیان کرد و دەستیان بەسەردا گرت.

ئێمە سەرەتای کاری مەرداویج و چۆنیەتی گۆڕانی بارودۆخی ئەو ئاماژە پێدەدەین.

## جەنگی موسوڵمانان لەگەڵ رۆمییەکان

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەتەرسوسەوە مەبەستی رۆمیان کرد. رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و چوارسەد موسوڵمانیان ئەسیر کرد و سەریان بڕین.

لەم ساڵەدا دوموستوق لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەرۆمەوە بەرەو دەبیل بەرێکەوت. سوبوکی لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرگری لەم شارە کرد. دوموستوق، عارەبانەی جەنگی و بەردهاوێژ و ئاگر هاوێژی پێبوو. دوانزە پیاو ئاگر هاوێژێکیان دەتەقاند. کەس نەیدەتوانی لەبەر سوتێنەری و گەرمی ئەم ئاگرە لێی نزیك ببێتەوە و ئەمە یەکێك لەقورسترین کەرەستەکانی جەنگ بوو کەموسوڵمانان نەیاندەتوانی بەرگەی بگرن. فەرماندەی ئەم دەستەیە لەبوێرترینی جەنگاوەران بوو. موسوڵمانێك تیرێکی بۆ هاویشت و گیانی گرت و موسوڵمانانی لەشەڕ و بەلای ئەو ئاسوودە کرد.

دوموستوق لەسەر تەختێك دانیشتبوو و سەیری شار و سوپاکەی دەکرد و لەسەر بنەمای بینینەکانی خۆی، رێنوێنی سوپاییەکانی دەکرد.. دانیشتوانی شار خۆڕاگرییان دەکرد و دوموستوق لەسەر جەنگ پێداگری تا ئەوەی سوپای رۆمییەکان خۆیان گەیاندە دیواری شارەکە و چەندین تونێلیان لێدا و ڕۆشتنە ناو شارەکە. دانیشتوانی شار و پاسەوانانی قەلای شارەکە رووبەروویان بوونەوە و سەرئەنجام موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و رۆمییەکانیان لەشارەکە دەرپەڕاند و نزیکەی دە هەزار کەسیان لێ کوشتن.

لەزیقەعدە/ دێسامبەری ئەم ساڵە، سەمەل لەگەڵ سوپاکەی خۆی دوای ئەنجامدانی جەنگی هاوینە بێ هیچ زیانێك بۆ تەرسوس گەڕایەوە و لەرێگە رووبەرووی سوپایەکی گەورەی رۆمییەکان بوویەوە و دوای جەنگ، موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و ژمارەیەك لەرۆمییەکانیان کوشت و تالانی زۆریان

دەستکەوت. لەناو تالآنییەکان سێسەد هەزار سەڕ مەڕ دەبینرا جیاواز لەو مەڕانەی پێشتر لەگەڵ خۆیان هێنابوویان. لەرێگە پیاوێك بەناوی کوڕی زوحاك رێگەی لێگرتن. ئەو یەکێك لەسەرکردە کوردەکان و خاوەنی قەلآیەك بوو بەناوی جەعفەری. پشتی کردبووە ئایینی ئیسلام و پەیوەستی پاشای رۆم بو. پاشای رۆم چەندین دیاری پێشکەش کرد و داوای لێکردبوو لەقەلآکەی خۆی بمێنێتەوە. موسوڵمانان رووبەرووی بوونەوە و دوای جەنگ، ئەسیریان کرد و هەموو هاوەلآنیان کوشت.

## رۆشتنی سوپای مەهدی بەرەو مەغریب

لەم ساڵەدا مەهدی عەلەوی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، کوڕەکەی، باوکی قاسمی لەمانگی سەفەر/ ئاوریل لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو مەغریب ڕەوانە کرد. هۆکاری ئەم ڕەوانە کردنە گرتنی محەممەد کوڕی خەرزەناتی بوو چوونکە دەستی بەسەر سوپایەك لەکوتامە سەرکەوتبوو و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشتبوو. ئەم رووداوە بەلای مەهدییەوە گران و لەبەر ئەمە کوڕەکەی ڕەوانە کرد. کاتێك باوکی قاسم بەرێکەوت، دوژمنان ئاشبەتاڵیان لێکرد. ئەو ڕۆشت و گەیشتە تاهەرت و کاتێك لەم سەفەرە گەڕایەوە، بەڕمەکەی خۆی نەخشەی شارێکی لەسەر زەوی کێشا و ناوینا محەممەدییە. دەیویست ئەم شارە لەمەس دروست بکات و لەبەر ئەمە دانیشتوانی مەسیلەی بۆ فەحسی قیروان راگواست و چوونکە لەشۆڕشی ئەوان دەترسا بڕیاریدا لەنزیك ئەو شارە نیشتەجێیان بکات. ئەوان هاوەلآنی باوکی یەزیدی خارجی بوون و ژمارەیەکی زۆریان لەمحەممەدییە نیشتەجێ بوون. باوکی قاسم فەرمانی بەفەرمانڕەوای ئەم شارەدا توێشووی فراوان کۆبکاتەوە و لەناو ئەنبارەکاندا پاشەکەوتیان بکات و بیانپارێزێت. فەرمانڕەوا ئەو کارەی کرد. ئەم توێشووە لەناو ئەنبارەکاندا مایەوە تا ئەو کاتەی باوکی یەزید شۆڕشی کرد و مەنسور رووبەرووی بوویەوە. باوکی قاسم توێشووی لەمحەممەدییە هەڵدەگرت چوونکە لەهیچ شارێکی دیکە سیلۆیان نەبوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا ئیبراهیمی میسمەعی بەهۆی تایەکی قورسەوە مرد. ئەو لەنەوبەندجان چاوی لێکنا. موقتەدر، لەجێگەی ئەو یاقوتی وەك فەرمانڕەوای فارس هەڵبژارد و بلوکی تاهیر محەممەد کوڕی عەبدسەمەدی وەك فەرمانڕەوای کرمان دیاریکرد. خەلاتی بەهەردووکیاندا و ئالاّی فەرمانڕەوایەتی بۆ بەستن.

لەم ساڵەدا سوارەکان لەبەغداد شۆرشیان کرد و هێرشیان کردە سەر نوێژگە و کۆشکی ناسراو بەسورەیایان تالاّن کرد. چوارپێکانی ناو کۆشکەکەیان سەربڕی. مونس ڕۆشتە لایان و بەڵێنیدا مانگانەیان پێ بدات و ئاژاوەچییەکان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە ئەلناسر ئەلدین اللەی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، بەسەر دانیشتوانی تولەیتەڵەدا زاڵ بوو. ئەو بۆ ماوەیەك گەمارۆی خستە سەر شارەکە و کاتێك سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ژمارەیەکی زۆر لەئاوەدانییەکانی وێران کرد و بارودۆخی شارەکەی شێواند. تولەیتەڵە لەم کاتەدا بەیەکێك لەشارە ئیسلامییەکان دادەنرا.

لەم ساڵەدا عەرەبە دەشتەکییەکان مەبەستی هێرش کردنە سەر کەنارەکانی کوفەیان کرد وتالاّنکارییان کردە پیشە و دواتر ڕۆشتنە حیرە و تالاّنییان کرد. خەلیفە سوپایەکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان ڕەوانە کرد و ئەوانیان لەشارەکە دوورخستەوە.

لەرەبیع الاوەل/ مەی ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی گەورە (بەردی ئاسمانی، نەیزەك) کەوتە خوار و هێشتا دوو کاژێر بۆ کۆتایی ڕۆژ مابوو کەدەنگی مەترسیداری لێ بەرز بوویەوە. لەجومادی الاخرە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ئاگرکەوتنەوەیەکی گەورە لەروسافە لەرۆژهەلاّتی بەغداد ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر لەگەڕەکەکانی روسافە و گەڕەکی وەسیفی جەوهەری و مورەبەعەی خورسی لەبەغداد سووتان.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی سەری ناسراو بەکوڕی سەراجی نەحوی، نووسەری کتێبی الاصول فی النحو، مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بە ساڵی ٩٢٩/٣١٦ زایینی دەزانن.

لەشەعبان/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە باوکی حەسەن عەلی کوڕی سلێمانی ئەخفەش لەناکاو مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شانزەی کۆچی ( ٩٢٩ زایینی )

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان

کاتێك قەرەمتییەکان لەئەنبار ڕۆشتن، مونسی خزمەتکار بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەسێی موحەرەم/ بیست و هەشتی فەوریە هاتە ناو بەغداد. باوکی تاهیر قەرەمتی لەرێگەی فوراتەوە ڕێگەی دالیەی گرتەبەربەر بەڵام لەوێ هیچی دەستنەکەوت و دەستەیەك لەدانیشتوانی ئەو ناوچەی کوشت و دواتر ڕێگەی ڕەحبەی گرتەبەر و لەهەشتی موحەرەم/ سێ مارس دوای جەنگ لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شارە، ڕۆشتە ناو شارەکە و هەرچەند سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، بەڵام شمشێری خستە ناویان. فەرمان بەمونس درا بەرەو ڕەققە بڕوات. مونس لەسەفەر/ مارس بەرەو ڕەققە بەرێکەوت و ڕێگەی خۆی لەموسڵەوە هەڵبژارد و لەرەبیع الاوەل/ ئاوریل گەیشتە ئەو شارە و لەوێ ئوردووی لێدا. خەڵکانی قرقیسیا کەسیان بۆلای باوکی تاهیر نارد و داوای ئەمانیان کرد. باوکی تاهیر ئەمانی پێبەخشین و فەرمانی پێدان کەس لەوان لەرۆژدا نەبینرێت. ئەوان رازی بوون.

باوکی تاهیر دەستەیەکی بۆ جەنگی عەرەبەکانی جەزیرە ڕەوانە کرد. هاوەڵانی باوکی تاهیر سامانی ئەوانیان تاڵان کرد. عەرەبەکان لەوان ترسان و هەڵهاتن. باوکی تاهیر هەرکام لەوانی ناچار کرد یەك دینار باج بدەن. ئەوان دەبوا ئەم باجە لەهەجەر(شوێنی مانەوەی باوکی تاهیر) بدەن. دواتر باوکی تاهیر لەرەحبەوە بەرەو رەققە ملی ڕێگەی گرتەبەر. سوپاکەی گەیشتە دەوروبەری شارەکە و سی کەس لەدانیشتوانی شارەکەیان کوشت. خەڵکانی ڕەققە بۆ هاوکاری خەڵکی گەڕەکەکان ڕۆشتن و دەستەیەك لەقەرەمتییەکانیان کوشت. قەرەمتییەکان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەگەڵ ئەوان جەنگان و دواتر لەکۆتاییەکانی رەبیع الاوەل/ بیست و سێی جون ئەو دیارەیان بەجێهێشت.

قەرەمتییەکان دەستەیەکیان بۆ ڕەئس عەین و کەفرتوسا ڕەوانە کرد. خەڵکانی ئەو دەڤەرە داوای ئەمانیان کرد. قەرەمتییەکان ئەمانیان پێبەخشین و بەرەو

سنجار بەرێکەوتن و لەچیاکان تالآنکارییان کردە پیشە و ڕۆشتنە ناو سنجار. دانیشتوانی سنجار داوای ئەمانیان کرد و پێیان بەخشرا.

مونس کەگەیشتبووە موسڵ، لەمەبەستی قەرەمتییەکان بۆ ڕۆشتن بۆ ڕەققە ئاگادار بوویەوە و بەخێرایی بەرەو ئەو ناوچەیە ئەسپی غاردا بەلآم باوکی تاهیر لەوێ ڕۆشت و بۆ رەحبە گەڕایەوە. مونس دوای ڕۆشتنی قەرەمتییەکان لەڕەققە گەیشتە ئەو شارە. دواتر قەرەمتییەکان مەبەستی هەیتیان کرد. خەڵکانی هەیت دیوارەکانیان بەهێز کردبوو. ئەوان ڕووبەڕووی باوکی تاهیر بوونەوە و باوکی تاهیر دەستی لەوان هەڵگرت و هێرشی کردە سەر کوفە. هەواڵەکانی ئەو گەیشتە بەغداد و هارون کوڕی غەریب و بەنی کوڕی نەفیس و نەسری پەردەدار بەرەو کوفە ڕەوانە کران. سوپای قەرەمتی گەیشتە کۆشکی هوبەیرە و ژمارەیەك لەدانیشتوانی ئەو ناوچەی کوشت.

نەسری پەردەدار لەرێگە گرفتاری تایەکی کوشندە بوو بەلآم بەرگەی گرت و درێژەی بەرێگەدا و کاتێك قەرەمتییەکان لێی نزیك بوونەوە، چیتر هێزی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان لەخۆیدا نەدەبینی. ئەو، ئەحمەد کوڕی کەیغلەغی لەجێگەی خۆی دانا. نەخۆشییەکەی بەڕادەیەك تەشەنەی کرد کەزمانی لەگۆ کەوت. ئەویان بۆ بەغداد گەڕاندەوە بەلآم لەکۆتاییەکانی رەمەزان/ نۆڤەمبەر لەرێگەدا مرد. هارون کوڕی غەریبیان لەجیاتی ئەو وەك فەرماندەی سوپاکە هەڵبژارد. کوڕی نەسر پەردەدار، لەناو پەردەداران، جێگەی باوکی گرتەوە. قەرەمتییەکان ڕێگەی بیابانیان گرتەبەر و هارون و سوپاکەی بۆ بەغداد گەڕانەوە و لەبیست و دووی شەوال/ دەی دێسامبەر گەیشتنە بەغداد.

## لابردنی عەلی کوڕی عیسا و وەزارەتی باوکی عەلی کوڕی موقلە

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عیسا لەوەزارەتی خەلیفە لابرا و باوکی عەلی کوڕی موقلە جێگەی ئەوی گرتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك عەلی کوڕی عیسا ئاگادار بوویەوە لەرۆژگاری وەزارەتی خاقانی و خوسەیبی باجەکان کەمی کردووە و بارودۆخ پەرێشان بووە و خەرجییەکان زیادی کردووە، و لەکاتی گەڕانەوەی سوپاییەکان لەئەنبار، موقتەدر دووسەد و چل هەزار دیناری بەمانگانەی ئەوان زیاد کردووە، و خەرجی خزمەتکار و پەردەدارەکان و کەسانی ناو پەردەکان و بەتایبەت دایکی موقتەدر فراوان بووە، ترسا و ئەم بارودۆخەی پەسەند نەکرد. جیاواز لەوە نەسری پەردەدار بۆ لابردنی ئەو هەوڵی دەدا چوونکە مونس خوازیاری وەزارەتی عەلی کوڕی عیسا بوو و نەسر لەگەڵ هەر شتێکی مونس، دژایەتی دەکرد و بەهۆی ئەم هەموو دژوارییەوە بوو کاروبارەکانی وەزارەتی پشت گوێخست و بیانوی بۆ ئەم کارە پیری و ناتەوانی بوو. موقتەدر پێشنیاری خۆڕاگری پێکرد و پێی وت: تۆ بۆ من وەك موعتەزیدی باوکم وایت، بەڵام عەلی کوڕی عیسا بۆ دەست لەکارکێشانەوە پێداگری کرد. موقتەدر لەمبارەوە راوێژی لەگەڵ مونس کرد و ناوی سێ کەسی بۆ ئەو پێگەیە هێنایە سەرزمان: فەزڵ کوڕی جەعفەر کوڕی فورات کەدایکی حەیرانە و خوشکەکەی هاوسەری موحسن کوڕی فورات بوو، باوکی عەلی کوڕی موقلە و محەممەد کوڕی خەلەف نەیرەمانی کەوەزیری کوڕی باوکی ساج بوو. مونس وتی: فەزڵ ئێمە مامی ئەومان (باوکی حەسەن کوڕی فورات و کوڕە مامی ئەومان، موحسن کوڕی فورات و هاوسەری خوشکەکەیمان کوشتووە و دەستمان بەسەر سامانی خوشکەکەیدا گرتووە و لەو ئاسوودە نابین. کوڕی موقلە گەنجێکە خام و بێ ئەزمون و شیاوی پێگەی وەزارەت نییە، محەممەد کوڕی خەلەف نەزانێکی چاونەترسە و هیچ کارێك بەراستی ناباتە سەر و باشترە عەلی کوڕی عیسا بۆ ئەو کارە ناچار بکەین.

دواتر مونس، چاوی بەعەلی کوڕی عیسا کەوت و دڵنەوایی کرد. عەلی پێی وت: ئەگەر تۆ لێرە دەمایتەوە، هاوکاریم لەتۆ وەردەگرت، بەڵام تۆ بەیانی دەڕۆیتە

ڕەققە و شەو لەشامیت.

باوکی عەلی کوڕی موقلە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و بۆ بەدەست هێنانی وەزارەت هەوڵەکانی خستەگەڕ و بەڵێنیدا بڕە پارەیەکی زۆر بەگەنجینە بدات. موقتەدر لەمبارەوە راوێژی لەگەڵ نەسری پەردەدار (هێشتا زیندوو بوو) کرد. نەسر وتی: فەزڵ کوڕی فورات لەکاروباری دەبیری و وەزیری شیاوو شارەزایە، بەلاّم تۆ دوێنێ مام، کوڕە مام و زاواکەی ئەوت کوشت و سامانی دایك و خوشكی ئەوت زەوت کرد. کوڕەکانی فورات رافضین و شوێنکەوتەی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبن. باوکی عەلی کوڕی موقلە پێگەی لەناو خەڵکدا نییە و بەکەسێکی شیاو و شارەزا ناناسرێت. نەسری پەردەدار لەسەر بنەمای هاورێیەتی خۆی لەگەڵ محەممەد کوڕی خەلەف، پێشنیاری ئەوی کرد. موقتەدر لەبەر ئەوەی محەممەدی بەکەسێکی نەترس و نەزان دەزانی، حەزی بەوەزارەتی ئەو نەدەکرد. کوڕی موقلە دیاری گرانبایی بۆ نەسری پەردەدار دەنارد و نەسر پەردەدار، پێشنیاری وەزارەتی ئەوی کرد. سەرئەنجام موقتەدر ئەوی وەك وەزیری خۆی هەڵبژارد.

کوڕی موقلە کاتێك باوکی تاهیر لەئەنبار نزیك کەوتەوە، یەکێك لەهاورێکانی لەگەڵ پەنجا کۆتری نامەبەر بۆ ئەنبار نارد و دەستبەجێ هەواڵەکانی بەموقتەدر دەگەیاند. هەواڵەکان دەگەیشتە نەسری پەردەدار و لەنەسرەوە بەموقتەدر دەگەیشت. نەسر بەخەلیفەی وت: ئەمە نمونەی کاری کوڕی موقلە لەرۆژگارێکە کەهیچ پاداشێکی بۆ ئەم کارەی پێ نادرێت چ بگات بەوەی تۆ چاکەی لەگەڵ بکەیت. ئەمە یەکێك لەسەرەکیترین پاڵنەرەکان بۆ هەڵبژاردنی ئەوە.

موقتەدر لەنیوەی رەبیع الاوەل/ نۆی مەی فەرمانیدا عەلی کوڕی عیسای وەزیر و براکەی عەبدولرەحمان قۆلبەست بکەن. خەلاّتی وەزارەتی بەباوکی عەلی کوڕی موقلە بەخشی و وەزارەتی بەو سپارد. باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی لەسەر بنەمای هاورێیەتی خۆی لەگەڵ باوکی عەلی کوڕی موقلە، بۆ گەیشتن بەم پێگەیە هاوکاری کرد.

## سەرەتای کاری باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی و براکانی

ئەو کاتەی عەلی کوڕی عیسا وەزارەتی گرتەدەست، باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی سەرپەرەستی زەوییە تایبەتییەکان بوو و براکەی باوکی یوسف، باجی سورقی کۆدەکردەوە. کاتێك عەلی کوڕی عیسا کارگوزارەکانی هەڵدەبژارد و هەرکەسی بۆ شوێنی دیاریکراو ڕەوانە دەکرد، باوکی عەبدوللە پێی وت: کەسانێکی لەو شێوە بۆ ئەنجامدانی کاروبارە گرنگەکان رادەسپێریت و من تەنیا بۆ سەرپەرەستی کردنی زەوییە تایبەتییەکانی ئەهواز و براکەم بۆ کۆکردنەوەی باجی سورق، نفرینی خواوەند لەکەسێك بەم پێگە و جێگەیە رازی بێت. ئەم دەهۆڵەی من دەنگێکی هەیە و دوای چەند رۆژێك دەبیسترێت.

کاتێك هەواڵی پەرێشانی کاروبارلای وەزارەتی عەلی کوڕی عیسای پێگەیشت، براکەی، باوکی حسەینی بۆ بەغداد نارد تا کەنارەکانی ئەهواز و داهاتەکانی لەوەزیر بخوازێت کەبەرتیل وەردەگرێت و کاتێك باوکی عەلی کوڕی موقلە هاتەسەرکار، باوکی عەبدوللە بیست هەزار دیناری پێدا و ئەویش، هەموو ئەهواز جگە لەشوش و جوندیشاپوری بەباوکی عەبدوللە سپارد و براکەی، باوکی حسەینی وەك کارگوزاری فوراتییە دەستنیشان کرد. باوکی یوسفی کردە سەرپەرەستی زەوییە تایبەتەکان و فەرمانیدا باوکی ئەییووبی سمسار ئۆدەداری کۆکردنەوەی باج بێت تا ئەوان جڵەوی کاروبارەکان بگرنەدەست.

باوکی عەلی کوڕی موقلە نامەیەکی بۆ باوکی عەبدوللە نووسی و فەرمانی پێدا کوڕی باوکی سەلاسل بگرێت. ئەو خۆی بەرێکەوت و کوڕی باوکی سەلاسلی لەشوشتەر گرت و دە هەزار دیناری لێسەند بەلاّم ئەم پارەی بۆ باوکی عەلی نەنارد. باوکی عەبدوللە بەرادەیەك نەزان بوو بیری لەدەرئەنجامی کارەکانی نەدەکردەوە و نەیدەزانی باوکی موقلە بەزووترین کات لەفرت و فێڵ و بی دینی و نەترسی ئەو ئاگادار دەبێتەوە.

باوکی عەلی کوڕی موقلە، باوکی محەممەد حسەین کوڕی ئەحمەدی مادەرانی وەك چاودێری باوکی عەبدوللە دەستنیشان کرد بەلاّم باوکی عەبدوللە گرنگی

بەباوکی محەممەد نەدەدا.

بورەیدی بەبا و را بۆ بەرید دەگەڕێتەوە. ئەمیر کوڕی ماکولا بەم شێوەیە ئاماژەی پێداوە بەڵام کوڕی مسکویە بە یا و زا (یەزیدی) ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: باوەگەوڕێی ئەو لەخزمەتی یەزید کوڕی مەنسوری حومەیریدا بووە و بۆ ئەو دەگەڕێتەوە بەڵام ئێمە گێڕانەوەی یەکەم بەراست دەزانین و گێڕانەی کوڕی مسکویەمان ئاماژە پێدا تا خوێنەر گومان نەکات لەگێڕانەوەی ئەو بێ ئاگایین و بەهەڵە ئەم وشەمان(بورەیدی) گێڕاوەتەوە.

## ئەو قەرەمتییانەی لەکەنارەکانی عێراق دەرکەوتن

کاتێك دەرەئەنجامی باوکی تاهیر قەرەمتی بەو شێوەی لێهات کەئاماژەمان پێدا، شوێنکەوتەکانی قەرەمتی لەکەنارەکانی عێراق، کەلەترسا، باوەڕی خۆیان دەشاردەوە، پەردەیان لەسەر باوەڕی خۆیان هەڵگرت و زیاتر لەدە هەزار کەسیان لەدەوروبەری واست کۆبوونەوە و جڵەوی کارەکانی خۆیان بەپیاوێك سپارد بەناوی حورەیس کوڕی مەسعود. دەستەیەکی گەورەی دیکەی لەعەین تەمر و کەنارەکانی کۆبوونەوە و جڵەوی کارەکانی خۆیان بەپیاوێك بەناوی عیسا کوڕی موسا سپارد. ئەوان پێشنیاری پەیوەست بوون و شوێنکەوتنی مەهدییان بەخەڵك دەکرد.

عیسا روویکردە کوفە و لەدەرەوەی شارەکە ئوردووی لێدا و باجی کۆکردەوە و کارگوزارەکانی لەو سنورە دەرکرد. حورەیس کوڕی مەسعود روویکردە کەنارەکانی موەفقی و لەوێ خێوەتێکی هەڵدا و بەکۆچگە (شوێنی کۆچ) ناوی برد و دەستی بەسەر ئەو سنورەدا گرت. هاوەڵانی ئەو تاڵانییا دەکرد و خەڵکانیان ئازار دەدا و دەیانکوشتن. ئۆدەداری جەنگی واست (بەنوێنەرایەتی خەلیفە) بەنی کوڕی نەفیس بوو. بەنی رووبەروویان بوویەوە بەڵام ئەوان بەهەڵاتن ناچاریان کرد. موقتەدر، هارون کوڕی غەریبی بۆ جەنگی حورەیس کوڕی مەسعود و سوپاکەی ڕەوانە کرد و بەهەمان شێوە سافی بەسری بۆ جەنگی عیسا کوڕی موسا بۆ کوفە نارد. هارون و سافی رووبەرووی قەرەمتییەکان بوونەوە و قەرەمتییەکان شکستیان

خوارد و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر و زۆربەی ئەسیرەکان کوژران و ئالا سپییەکانی ئەوان داگیرا. لەسەر ئەم ئالایانە نوسرابوو: (( دەمانویست منەتیان بکەینە سەر ئەوانەی بێچارە و گرفتار بوون لەسەر زەوی و ئەوان بکەینە پێشەواکان و بیانکەینە میرات بەران.))[16] ئالاکانیان سەرەوخوار هێنایە بەغداد و بارودۆخی قەرەمتییەکان لەدەوروبەری عێراق شێوا و خواوەند خەڵکانی لەخراپەکاری ئەوان ئاسوودە کرد.

## جەنگی نازوك لەگەڵ هارون کوڕی غەریب

لەم ساڵەدا لەنێوان نازوك، فەرماندەی پاسەوانەکان و هارون کوڕی غەریب ناسازگاری روویدا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوەبوو کە سەرپەرەستی ئەسپەکانی هارون و سەرپەرەستی ئەسپەکانی نازوك لەسەر کوڕێکی خەساو و (حین) رووبەرووی یەکبوونەوە و بەدار و تێلا کەوتنە گیانی یەك. نازوك دوای تێهەڵدان، سەرپەرەستی ئەسپەکانی هارونی زیندانی کرد. هاوەڵانی هارون هێرشیان کردە سەر زیندانی پاسەوانەکان و پەلاماری نوێنەری نازوکیاندا و هاورێکەیان لەزیندان هێنایەدەر. نازوك سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و سکالای بردە لای موقتەدر. موقتەدر وتی: ئێوە هەردووك لای من رێزدارن و من بەشداری ئەم کێشەی ئێوە ناکەم. نازوك گەڕایەوە و پیاوەکانی خۆی ئامادە کرد. هارونیش هێزی خۆی کۆکردەوە. هاوەڵانی نازوك مەبەستی کۆشکی هارونیان کرد بەڵام ئەو دەرگای داخست و دەستەیەك لەهاوەڵانی لەدەرەوە مانەوە و سوپاکەی نازوك چەند کەسێکیان کوشت و دەستەیەکیان بریندار کرد. لەم کاتەدا هارون دەرگای کۆشکەکەی کردەوە و هەموو پیاوەکانی هاتنەدەر و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی نازوك و ژمارەیەکیان کوشتن و دەستەیەکیان بریندار کرد. لەنێوان ئەم دوو سوپایە ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. نازوك گەڕایەوە.

خەلیفە پەیامی بۆ ناردن و کاری ئەوانی بەقێزەون لەقەڵەمدا و هەردووك

---

[16] - قصص/٥ (و نريد ان نمن على الذين استضعفوا فى الارض و نجعلهم ائمة و نجعلهم الوارثين. )

دەستیان لەشەڕ هەڵگرت و هێور بوونەوە. نازوك ترسا و زانی موقتەدر دڵی لێ ڕەش کردووە. دواتر هارون ڕۆشتە لای و دەستی سازگاری و ئاشتی بۆ درێژ کرد و هاورێکانی خۆی بردە بێستانی نەجمی تا لەنازوك دوور بن (بۆ ئەوەی جارێکی دیکە شەڕ هەڵنەگیرسێت). خەڵك دەیانوت: هارون بۆتە ئەمیری ئەمیرەکان و ئەمە لای هاوەڵانی مونس دژوار بوو. ئەم بەسەرهاتەیان بۆ مونس لەڕەققە نووسی و ئەو بەخێرایی بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەسەرەوەی بەغداد لەشەماسییە ئۆردووی لێدا وسەردانی موقتەدری نەکرد. ئەمیر باوکی عەباس کوڕی موقتەدر و کوڕی موقلەی وەزیر بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشتن و سڵاوی موقتەدر و دڵتەنگی ئەویان لەهارون پێ ڕاگەیاند. مونس هاتە کۆشکی موقتەدر. لەکاتێکدا هەرکام دڵی لەوی دیکە ڕەش بوو. موقتەدر، هارون کوڕی غەریب ئەلخال کەکوڕە خاڵی بوو، بانگی کرد و ئەوی لەکۆشکەکەی جێگە کردەوە. کاتێك مونس بەمەی زانی، گومانی زیادی کرد. لەم کاتەدا باوکی هەیجا کوڕی حەمدان لەکوێستان (لوڕستان) گەڕایەوە و لەکەنار ماڵەکەی مونس نیشتەجێ بوو. سوپایەکی گەروە هاورێیەتی باوکی هەیجای دەکرد. لەنێوان خەلیفە و مونس چەندین نامە ئاڵ و گۆڕ کرا و فەرماندەکان یەك لەدوای یەك پەیوەستی مونس دەبوون و بەم شێوەیە ئەم ساڵە کۆتایی هات.

## کوژرانی حەسەن کوڕی قاسمی داعی

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی قاسمی داعی عەلەوی کوژرا. پێشتر باسی زاڵبوونی ئەسفار کوڕی شیرویەی دەیلەمیمان لەتەبەرستان و هاورێیەتی مەرداویجمان لەگەڵ ئەو کرد. کاتێك ئەوان دەستیان بەسەر تەبەرستاندا گرت، حەسەن کوڕی قاسم دەستی بەسەر ڕەی گرتبوو و هاوەڵانی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی لەوێ دەرپەڕاندبوو. ماکان کوڕی کالی دەیلەمی هاورێیەتی ئەوی دەکرد. ئەو لەم کاتەدا بەرەو تەبەرستان بەرێکەوت و سوپاکەی ئەو لەساری ڕووبەرووی سوپاکەی ئەسفار بوویەوە وئاگری شەڕێکی قورس بڵێسەی سەند و حەسەن و ماکان کوڕی کالی هەڵاتن. شوێنپێی حەسەنیان هەڵگرت و خوێنیان ڕشت.

هەڵاتنی زۆربەی هاوەڵانی حەسەن دەست ئەنقەست بوو چوونکە حەسەن بەردەوام سوپاکەی خۆی بۆ خۆڕاگری و خۆ دوورخستنەوە لەستەم و خۆ دوور خستنەوە لەمەی خواردنەوە هان دەدا و لەبەر ئەم سوپاییەکان ڕقی ئەویان لەدڵ گرتبوو. هاوەڵانی حەسەن (لەکاتی زیندوو بوونی) دەیانویست بڕۆنە لای هەروسندان یەکێك لەسەرکردەی خەڵکانی چیا و خاڵی مەرداویج و وەشمگیر و ئەو وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژێرن. ئەوان دەیانویست حەسەنی داعی بگرن و باوکی حسەین کوڕی ئەتروش وەك پێشەوای خۆیان هەڵبژێرن و بەناوی ئەو وتار بخوێننەوە.

هەروسندان لەگەڵ ئەحمەدی بالأبەرز دوای مەرگی سەعلوك لەدامغان مابوویەوە. ئەحمەد لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە و حەسەنی داعی لێ ئاگادار کردەوە و حەسەن خۆپارێزی کردە پیشە. کاتێك هەروسندان هات، حەسەن لەگەڵ سەرکردەکانی دیکە چاوی پێی کەوت و ئەوانی بردە کۆشکەکەی خۆی لەجورجان تا خواردن بخۆن. ئەوان نەیاندەزانی حەسەن لەمەبەستی ئەوان ئاگادار بۆتەوە. حەسەن لەگەڵ هاوەڵە تایبەتەییەکانی خۆی پلانی کوشتنی ئەوانی دانابوو. فەرمانی بەهاوەڵانیدا ڕێگە نەدەن هاوڕێیانی ئەوان بێنە ناو کۆشك. کاتێك ڕۆشتنە ناو کۆشك، حەسەن لەوەی بیریان لێدەکردەوە و لەکارە قێزەونەکانی ئەوان دوا و فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد و داوتر هاوەڵانی ئەوانی کە لەدەرەوەی کۆشك بوون، لەکوشتنی ئەوان ئاگادار کردەوە و فەرمانی پێدان سامانی سەروەرەکانی خۆیان تالأن بکەن. سوپایش سەرقاڵی تالأنییەکان بوون. سوپاکەی حەسەن لەکوژرانی سوپاسالارەکان چاوپۆشی کرد. کوژرانی ئەم سەرکردانە لای کەسە نزیکەکانی ئەوان دژوار بوو و ڕق و کینەی حەسەنیان لەدڵ گرت و دوای ئەم ڕووداوە لەو جیابوونەوە تا ئەوەی سەرئەنجام کوشتیان.

کاتێك حەسەن کوژرا، ئەسفار فەرمانڕەوایەتی تەبەرستان، ڕەی، جورجان، قەزوێن، زەنجان، ئەبهەر، قوم و کەرخی گرتەدەست و بووبە شوێنکەوتەی فەرمانڕەوای سامانی خوراسان، سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد و لەساری مایەوە و هارون کوڕی بەهرامی وەك کارگوزاری ئامول دیاریکرد. ئەسفار لەوە دەترسا

لەسنوری باوکی جەعفەر دووبارە ئاژاوە سەر هەڵبداتەوە، لەبەر ئەمە هارونی بانگ کرد و داوای لێکرد بەزاوایەتی یەکێك لەگەورەکانی ئامول رازی ببێت و لەشەوی بووکێنی باوکی جەعفەر و سەرکردە عەلەوییەکانی دیکە بانگێشت بکات. هارون ئەوانی لەو شەوەی ئەسفار دەیویست، بانگێشت کرد. ئەسفار بەخێرایی لەساری یەوە ئەسپی غاردا تا لەکاتی پێویست خۆی بگەیێنێتە ئامول و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکاتە سەر کۆشکی هارون. ئەو، باوکی جەعفەر و سەرکردەکانی دیکەی عەلەوی گرت و ڕەوانەی بوخارای کردن و لەوێ خرانە زیندانەوە تا ئەوەی – ئاماژەی پێدەدرێت – لەرۆژگاری ئاژاوەی باوکی زەکەریا لەزیندان رزگاریان بوو.

کاتێك ئەسفار لەتەبەرستان ئاسوودە بوو، ڕێگەی ڕەی گرتەبەر. ڕەی لەو کاتەدا ‌.لەژێر فەرمانی ماکان کوڕی کالی بوو. ئەسفار شاری ڕەی لێ سەند و دەستی بەسەردا گرت و ماکان ڕێگەی تەبەرستانی گرتەبەر و لەوێ مایەوە.

ئەسفار دەیویست بەسەر قەڵای ئەلەموت زاڵ ببێت. ئەم قەڵایە لەسەر چیایەکی بەرز لەکەنارەکانی دەیلەم جێگیر ببوو و چاوڕەش کوڕی مالکی دەیلەمی فەرمانڕەوایەتی دەکرد. ئەویان بەچاوڕەش ناو دەبرد چوونکە لەیەکێك لەچاوەکانی پەڵەیەکی ڕەش دەبینرا. ئەسفار نامەی بۆ نووسی و ڕێزی لێگرت و ڕۆشتە لای. ئەسفار ڕۆشتە لای چاوڕەش و داوای لێکرد بنەماڵەکەی لەقەڵای ئەلەموت دابنێت و لەبەرابەردا فەرمانڕەوایەتی قەزوێنی پێ بسپێرێت. چاوڕەش رازی و بنەماڵەکەی ئەسفار ڕۆشتنە قەڵاکە. ئەسفار کەم کەم هاوەڵە بڕواپێکراوەکانی خۆی دەناردە ئەم قەڵایە تا ئەوەی ژمارەیان گەیشتە سەد کەس. لەم کاتەدا چاوڕەشی لەقەزوێنەوە بانگ کرد و کاتێك هات، ئەسفار قۆڵبەستی کرد و دواتر خوێنی ڕشت.

کاتێك ئەسفار لەسومان گوزەری کرد، مناڵی ئەمیری دەماوەند داوای ئەمانی لێکرد بەڵام محەممەد کوڕی جەعفەری سومنانی لەهاتن بۆ لای ئەسفار خۆی بەدوور گرت و لەقەڵایەك لەگوندەکانی رەئس کەلب پەنای گرت. ئەسفار ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و کاتێك بەسەر شاری ڕەی زاڵ بوو، سوپایەکی بەفەرماندەیی

عەبدمەلیکی دەیلەمی بۆ جەنگی محەممەد کوڕی جەعفەری سومنانی ڕەوانە کرد تا محەممەد ناچار بکات لەو، (عەبدمەلیك) داوای پەیمانی ئاشتی بکات. ئەو کارەی کرد و عەبدمەلیك بەداواکەی رازی بوو. داوتر کەسێکی راسپارد تا محەممەد دژی عەبدمەلیك هان بدات. محەممەد میوانییەکی ڕێکخست و عەبد مەلیکی بانگێشت کرد. عەبدمەلیك لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵە بوێرەکانی خۆی ڕۆشتە لای محەممەد بەلاّم هەموویانی لەدەرەوەی قەلاّکەدانا خۆی بەتەنیا ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی جەعفەر. ئەوان دوو کاژێر پێکەوە گفتوگۆیان کرد. دواتر عەبدمەلیك داوای لێکرد بەمەبەستی راوێژ کردن پێکەوە دانیشن (بەتەنیا). محەممەد ئەو کارەی کرد و جگە لەبەندەیەکی نەجەوان کەس لای ئەوان نەمایەوە. لەم کاتەدا عەبدمەلیك پەلاماریدا و خوێنی ڕشت. محەممەد گرفتاری نەخۆشی نەقرس ببوو. عەبدمەلیك تەنافێکی هەوریشمی بۆ ئەم کاتە ئامادە کردبوو، تەنافەکەی دەرهێنا و بەپەنجەرەی ژوورەکەی بەست و خۆی پیّ شۆڕ کردەوە و رزگاری بوو. ئەو کۆیلە نەوجەوانە هاواری بەرز کردەوە و هاوەلاّنی محەممەد کوڕی جەعفەر دەرگایان شکاند و هاتنە ژوور. (عەبد مەلیك دەرگاکەی لەناوەوە داخستبوو) کاتێك هاتنە ناو ژوورەکە بینیان محەممەد کوڕی جەعفەر کوژراوە. ئەوان هەموو دەیلەمییەکانی کۆشکەکەیان کوشت و گیانی خۆیان پاراست.

سوپاکەی ئەسفار ژمارەی فراوان و پێگەی بەرز بوویەوە. سەرکێشی و یاخیگەری کردە پیشە و دژی ئەمیر سەعید، فەرمانڕەوای خوراسان، ئالاّی شۆڕشی بەرز کردەوە و مەبەستی ئەوەی کرد تاج لەسەر بکات و لەڕەی تەختێکی زێڕین بۆ فەرمانڕەوایەتی خۆی دانبێت و بەجەنگی خەلیفە و فەرمانڕەوای خوراسان هەستێت. موقتەدر، هارون کوڕی غەریبی لەگەڵ سوپایەك بەرەو قەزوێن ڕەوانە کرد. سوپاکەی ئەسفار لەقەزوێن ڕووبەڕوویان بوونەوە و هارون شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی لەکەنار دەروازەی قەزوێن کوژران. خەڵکانی قەزوێن هاوکاری هارونیان دەکرد و ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەسفار ڕقی ئەوان لەدڵ بگرێت.

ئەمیر سەعید، فەرمانڕەوای خوراسان، لەبوخاراوە هێرشی کردە سەر ئەسفار تا

سەرزەمینەکەی خۆی وەربگرێتەوە. ئەوە کاتێك گەیشتە نەیشابور کەئەسفار سوپاکەی خۆی ئامادە دەکرد. وەزیری ئەسفار، موتریف کوڕی محەممەدی جورجانی پێشنیاری پێکرد نامەیەك بۆ فەرمانڕەوای خوراسان بنووسێت و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نیشان بدات و سامانێکی زۆری بۆ بنێرێت، ئەگەر رازی بوو چ باشتر و ئەگەر رازی نەبوو، ڕێگەی جەنگ بگرێتەبەر.

لەناو سوپاکەی ئەسفار دەستەیەك تورك لەسوپاییەکانی فەرمانڕەوای خوراسان دەبینران کەهاورێیەتی ئەسفاریان دەکرد. وەزیر، ئەسفاری لەم دەستەیە ترساند. ئەسفار بەپێشنیاری وەزیرەکەی رازی بوو و نامەیەکی بۆ ئەمیر سەعید نووسی بەلاّم ئەمیر سەعید وەلاّمی نامەکەی نەدایەوە و لەسەر جەنگ پێداگری کرد. هاوەلاّنی ئەمیر سەعید پێشنیاریان کرد سامانەکان وەربگرێت و خوازیاری خوێندنەوەی وتار بەناوی خۆیەوە بێت و ئەویان لەجەنگ ترساند و وتیان: کەس نازانێت کێ لەم جەنگەدا سەرکەوتن بەدەست دێنێت. ئەمیر گوێی لەقسەکانی ئەوان گرت و بەداواکارییەکەی ئەسفار رازی بوو بەو مەرجەی سامانەکان ڕەوانە بکات. هەردووك ڕێگەی ئاشتییان گرتەبەر. ئەسفار دوای ئەم ئاشتییە، سەرقاڵی ڕێکخستنی کارەکانی خۆی بوو و ماڵیاتی ڕەی و کەنارەکانی پلەبەندی کرد. لەسەر ئەم بنەمایە ماڵیاتی هەر پیاوێك یەك دینار بوو چ لەدانیشتوان بێت یا لەرێبواران و بەم شێوەیە سامانێکی زۆر کۆبوویەوە کە بەدانی بەشێکی فەرمانڕەوای خوراسانی رازی دەکرد و بەم شێوەیە ئەمیری سامانی چیتر بۆ جەنگی ئەسفار سوپای کۆنەدەکردەوە.

پێگەی ئەسفار بەرز بوویەوە و کردەوەکانی پێچەوانەی رابردوو بوو. زۆرداری کردەپیشە و لەبەر ئەوەی کینەی قەزوێنییەکانی لەدڵدا بوو، مەبەستی ئەو شارەی کرد و جەنگێکی قورسی هەڵگیرساند. دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرت و سزای دان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. ستەمکاری کردە پیشە و دەیلەمییەکانی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد تا ئەو جێگەی، قەزوێنییەکان جێگەیان نەدەبوویەوە و گیانیان هاتە سەر لێو. ئەو بانگی بانگبێژی بیست کە لەسەر گوڵدەستەی مزگەوتەکەوە بانگی دەدا. فەرمانیدا لەسەرەوە بیهێننە خوار. خەڵکان

لەخراپەکاری و ستەمکاری ئەو هاواریان بەرز کردەوە و دانیشتوانی قەزوێن بۆ دەشتەکان هەڵاتن. پیاو، ژن و منداڵەکان دەگریان و نفرینیان دەکرد و لەخوا دەپاڕانەوە چارەسەری کێشەکانیان بکات. ئەویان لەم وتانە ئاگادار کردەوە، پێکەنی و گاڵتەی بەنفرین کردنی ئەوان کرد بەڵام بۆ بەیانی،- وەك ئاماژەی پێدەدرێت- شکستی خوارد.

## کوژرانی ئەسفار

لەناو سوپاکەی ئەسفار سەرکردەیەکی گەورە بوو بەناوی مەرداویج کوڕی زیاری دەیلەمی. ئەسفار ئەوی بۆ لای سەلار، ئەمیری شەمیرانی تەرەم (تارەم) نارد تا پێشنیاری فەرمانبەری ئەسفاری پێبکات. سەلار ئەو کەسەیە کوڕەکەی لەرۆژگارێکی دواتر بوو بەفەرمانڕەوای ئازەربایەجان و کەنارەکان. کاتێك مەرداویج ڕۆشتە لای سەلار، هەردووك لەگوشار و گرفتارییەکانی خەڵك سکاڵایان کرد و سوێند و پەیمانیاندا ئەسفار لەناو ببەن و بۆ جەنگی ئەو هاوکاری یەکتر بکەن.

ئەسفار گەیشتبووە قەزوێن و چاوەڕوانی وەڵامی مەرداویجی دەکرد. مەرداویج بۆ دەستەیەك لەسەرکردە بڕواپێکراوەکانی خۆی نامەی نووسی و ئەوانی لەهاوپەیمانی خۆی لەگەڵ سەلار ئاگادار کردەوە. ئەوانیش پەیوەستی بوون. سەربازەکانیش لەخراپەکاری و ستەمکاری ئەسفار بێزار ببوون. یەکێك لەو کەسانەی بڕیاریدا هاوکاری مەرداویج بکات، موتریف کوڕی محەممەد، وەزیری ئەسفار بوو. مەرداویج و سەلار مەبەستی ئەسفاریان کرد. ئەسفار ئاگادار بوویەوە و هەروەها زانی هاوەڵەکانی پەیمان و بەڵێنیان بەمەرداویج داوە. هەستی بەمەترسی کرد و ئەمە دوای ماوەیەك لەخراپەکاری لەگەڵ خەڵکانی قەزوێن و نفرین کردنی ئەوان بوو. سوپا دژی ئەسفار ڕاپەڕی و ئەو لەگەڵ دەستەیەك لەکۆیلەکانی هەڵات و ڕۆشتە ڕەی. ویستی لەسامانەکەی لای نوێنەرەکەی پارە هەڵگرێت بەڵام نوێنەرەکەی زیاتر لەپێنج هەزار دیناری پێنەدا و وتی: تۆ ئەمیریت و پێویستت بەپارە نییە. ئەسفار ئەوی بەجێهێشت و رووی کردە خوراسان و

نەبەیهەق مایەوە.

مەرداویج لەقەزوینەوە بۆ ڕەی گەڕایەوە و نامەیەکی بۆ ماکان کوڕی کالی نەتەبەرستان نووسی و داوای لێکرد هاوکاری یەکتر بکەن. ماکان کوڕی کالی شوێنپێی ئەسفاری هەڵگرت چوونکە ئەسفار ستەمی لەدانیشتوانی ئەو سنورەیش کردبوو. ئەسفار کاتێك زانی ماکان شوێنپێی هەڵگرتووە، ڕووی کردە بوست و لەدەشتەوە بەرەو ڕەی ڕێگەی گرتەبەر تا بڕواتە قەڵای ئەلەموت کەسامان و بنەماڵەکەی بەو قەڵایەدا بوو. یەکێك لەهاوڕێکانی لێی جیابوویەوە و مەرداویجی ئاگادار کردەوە. مەرداویج دەستبەجێ شوێنی کەوت. مەرداویج یەکێك لەسەرکردەکانی لەپێشەوە نارد. ئەوسەرکردەیە کاتێك ئەسفار لەئەسپەکەی دابەزیبوو بۆ ئەوەی وچان بگرێت، پێی گەیشتەوە. ئەو سەرکردەیە لەکاتی سڵاو بەئەمیر ناوی برد. ئەسفار پێی وت: ئەگەری هەیە بەسەرهاتی منت بیستبێت و بۆ بۆ گرتنی من هاتبێتیت؟ سەرکردە وەڵامی دایەوە: بەڵێ. هاوەڵانی ئەسفار دەستیان بەگریان کرد. ئەسفار بێزی لەم کارەی ئەوان کردەوە و وتی: بەم شێوەیە پەیوەستی سوپا بوون، ئایا نەتانزانیوە پاشایەتی هاوتایە لەگەڵ گرفتاری؟ دواتر بەپێکەنین ڕووی کردە سەرکردەکە و سەبارەت بەوکەسانەی دەستیان لەهاوکاری کردنی ئەو هەڵنەگرتووە پرسیاری کرد. سەرکردە وەڵامی دایەوە کەمەرداویج هەموویانی کوشت. ئەسفار وتی: ژیانی ئەم دەستەیە قورگی منی دەگوشتی و هەنووکە ئارام بووم. هەنووکە فەرمانەکەی خۆت بەجێبێنە. ئەو گومانی دەکرد ئەو سەرکردەیە هەڵگری فەرمانی کوشتنی ئەوە. سەرکردە پێی وت: فەرمانیان پێ نەداوم زیان لەتۆ بدەم یا بتکوژم. ئەوی بردە لای مەرداویج. مەرداویج ئەوی بەژمارەیەك لەهاوەڵانی سپارد تا بیبەنە ڕەی. یەکێك لەهاوەڵانی مەرداویج پێی وت: زۆربەی هاوڕێیانی تۆ، هاوەڵانی ئەم پیاوە بوون و لەو جیابوونەوە و پەیوەستی تۆ بوون و تۆ بەکوشتنی سەرکردەکان، ئەوانت گرفتاری ترس کردووە. لەکوێوە دڵنیایت لەوەی سبەی پشت ناکەنەتۆ و قۆڵبەستت ناکەن؟ لەم کاتەدا مەرداویج فەرمانی کوشتنی ئەسفاری دەرکرد و دواتر ڕێگەی ڕەی گرتەبەر.

لەچۆنیەتی کوژرانی ئەسفار ئاماژەیان بەوەداوە کە: کاتێك بەرەو قەڵای

ئەلەموت بەرێکەوت، لەدۆڵێك دابەزی تا کەمێك وچان بگرێت. بەرێکەوت مەرداویج بۆ راو هاتبووە دەر و لەگەڵ ئەوەیشدا گرنگی بەهەواڵەکانی شوێنکەوتنی ئەسفار دەدا. لەو دۆڵەدا ژمارەیەك سواری بینی. یەکێك لەپیاوەکانی خۆی نارد تا هەواڵی ئەوانی بۆ بێنێت و ئەو ئەسفار کوڕی شیرویە و ژمارەیەکی کەم لەهاوەڵانی بینی کە بەرەو قەڵای ئەلەموت دەڕۆن تا سامانەکانی لەو قەڵایە هەڵگرێت و سوپایەکی پێ کۆبکاتەوە و بۆ جەنگی مەرداویج بگەڕێتەوە. ئەسفار و هاوەڵانی ئەویان گرت و بردیاننە لای مەرداویج. مەرداویج کاتێك ئەوی بینی، دەستبەجێ سەری بڕی.

بەم شێوەیە بارودۆخ بۆ مەرداویج سەقامگیر بوو و دوای کوشتنی ئەسفار بەرەو قەزوێن ڕۆشت و دڵنەوایی خەڵکی ئەو دیارەی کرد و بەڵێنی چاکەی پێدان.

هەروەها وتوویانە ئەسفار لەبەر برسیەتی ڕۆشتە ئاشێك و لەئاشەوان داوای خواردنی کرد. ئاشەوان کەمێك نان و ماستی پێدا و لەگەڵ کۆیلەکەی – بێ ئەوەی کەسی دیکەیان لەگەڵدا بێت– لەنان و ماستەکەی خوارد. بەرێکەوت مەرداویج روویکردە ئەو دیارە ولای ئاشەکە شوێنپێی سمی ئەسپی بینی و سەبارەت بەو شوێنپێیە پرسیاری کرد. پێیان وت: دوو سوار ڕۆشتنە ناو ئەم ئاشە. مەرداویج کاتێك دەرگاکەی کردەوە، ئەسفاری بینی و دەستبەجێ سکی هەڵدڕی.

## سەرەتای فەرمانڕەوایەتی مەرداویج

بەشکستی ئەسفار لەمەرداویج، فەرمانڕەوایەتی ئەو دەستی پێکرد و کاتێك مەرداویج ئەسفاری گرت و کوشتی و فەرمانڕەوایەتییەکەی سەقامگیر بوو، هەموو شوێنەکان، شار بەشار و پارێزگا بەپارێزگای خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە. ئەو فەرمانڕەوایەتی قەزوێنی گرتەدەست و بەڵێنی چاکەکاری بەخەڵکەکەیدا. لەبەر ئەمە دانیشتوانی ئەم شارە خۆشەویستی خۆیان بۆ دەربڕی. دواتر فەرمانڕەوایەتی ڕەی، هەمەدان، کەنکور، دینەوەر، بروجێرد، قوم، کاشان، ئیسفەهان، جەربازقان (گوڵپایەگان) و شوێنەکانی دیکەی گرتەدەست.

مەرداویج خراپەکاری لەگەڵ خەڵکانی ئیسفەهان کردە پیشە و دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرت و رێگەی زۆرداری گرتەبەر. تەختێکیان لەزێر بۆ دروست

کرد کەخۆی لەسەری دادەنیشت و تەختێك لەسیم کەسەرکردە گەورەکان پاڵیان پێوە دەدا و هەرکات ئەو لەسەر تەخت دادەنیشت، سوپاییەکان دوور لەو دەوەستان و لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد مەگەر ئەو پەردەدارانەی بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کرابوون. خەڵکان لێی دەترسان.

## فەرمانڕەوای مەرداویج لەتەبەرستان

پێشتر لەهاوپەیمانی ماکان کوڕی کالی لەگەڵ مەرداویج و هاوکاری ئەو بۆ لەناوبردنی ئەسفار قسەمان کرد. کاتێك فەرمانڕەوایەتی مەرداویج سەقامگیر و سامان و ژمارەی سوپاییەکانی فراوان بوو، چاوی تەماحی بڕییە جورجان و تەبەرستان کە لەژێر فەرمانی ماکان کوڕی کالیدا بوو. بۆ ئەم مەبەستە سوپای کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر تەبەرستان. ماکان خۆڕاگری کرد بەڵام مەرداویج سەرکەوتنی بەدەست هێنا و تەبەرستانی خستە ژێر فەرمانی خۆی. ئەو بلقاسم کوڕی بانجین کەسوپا سالاری سوپاکەی بوو، لەوێ دانا. بلقاسم پیاوێکی دوورئەندێش، بوێر و بیرمەند بوو.

دواتر مەرداویج رێگەی جورجانی گرتەبەر. شیریزل کوڕی سەلار و باوکی عەلی کوڕی تورکی بەنوێنەرایەتی ماکان فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیان دەکرد. ئەم دووانە هەردووکیان لەبەرابەر مەرداویج هەڵاتن و مەرداویج دەستی بەسەر جورجاندا گرت و سورخاب کوڕی باوس، خاڵی بلقاسم کوڕی بانجینی وەك نوێنەری بلقاسم لەو دیارە بەجێهێشت. بەم شێوەیە بلقاسم جورجان و تەبەرستانی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و مەرداویج سەرکەوتوو و لەگەڵ تالانییە فراوانەکان بۆ ئیسفەهان گەڕایەوە.

ماکان رۆشتە دەیلەم و داوای هاوکاری لەباوکی فەزلی سائیر کرد. باوکی فەزڵ رێزی لێگرت و هەردووك هێرشیان کردە سەر تەبەرستان و بلقاسم رووبەرووی هەردووکیان بوویەوە. ماکان و سائیر شکستیان خوارد. سائیر بەرەو دەیلەم هەڵات و ماکان رێگەی نەیشابوری گرتەبەر و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد و داوای هاوکاری لێکرد و ئەو بەزۆرینەی سوپاکەی هاوکاری

ماکانی کرد و بەهاوکاری کردنی ماکان زێدەڕۆیی کرد. ماکان و باوکی عەلی خۆیان گەیاندە مەرداویج و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد بەڵام هەردووکیان شکستیان خوارد و بۆ نەیشابور گەڕانەوە. دواتر ماکان کوڕی کالی روویکردە دامغان تا فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیە بگرێتەدەست. بلقاسم بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و رێگەی لێگرت. ماکان بۆ خوراسان گەڕایەوە. پاشماوەی ئەم بەسەرهاتە لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵەکانی دواتر ئاماژە پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

ئەم ساڵە سەرەتای کاری یەزیدی خارجی لەمەغریب بوو و لەساڵی ٩٤٥/٣٣٤ زایینی ئاماژە بەبەسەرهاتەکانی ئەو دەدەین.

لەم ساڵەدا پیاوێکی خارجی (لەخەواریج) لەسیستان دەرکەوت و لەگەڵ دەستەیەك بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر فارس هێرشی کردە سەر ئەو سەرزەمینە، بەڵام هاوەڵانی پێش گەیشتن بەفارس کوشتیان و بڵاوەیان لێکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی نەسری عەشوری لەپەردەداری خەلیفە دوورخرایەوە و یاقوت کارەکانی ئەوی گرتە ئەستۆ. ئەو پێشتر هەڵسورێنەری کاروباری جەنگی فارس بوو و لەوێ دەژیا. ئەو کوڕەکەی باوکی فەتح موزەفەری بەنوێنەرایەتی خۆی وەك پەردەدار راسپارد.

هەروەها لەم ساڵەدا دوموستوق لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەرۆمییەکان گەیشتە ئەرمەنستان و گەمارۆی خستە سەر شاری خەلات بەڵام خەڵك رێگەی سازانیان گرتەبەر و دوای ئەوەی مینبەری مزگەوتەکەی دەرهێنا و خاچێکی لەجێگەی ئەو دانا، شارەکەی بەجێهێشت. ئەو لەشاری بەدلیسیش هەمان کاری دووبارە کردەوە و خەڵکانی ئەرزەن و کەسانی دیکەی تۆقاند و هەموان شارەکانی خۆیان بەجێهێشت و گەورەکانیان رێگەی بەغدادیان گرتەبەر و داوای دادپەروەرییان لەخەلیفە کرد بەڵام گرنگی بەداواکانی ئەوان نەدرا.

لەم ساڵەدا حەوتسەد پیاوی رۆمی و ئەرمەنی بەتەور و تەشوێ هاتنە مەڵتییە و وایان نیشاندا بەمەبەستی کار هاتوونەتە ئەو شارە. دواتر ئاشکرا بوو مەلیحی

ئەرمەنی رێدار ئەوانی ناردووە تا هەرکات گەمارۆی خستە سەر شارەکە، دەروازەکان بکەنەوە و شارەکە بەو بسپێرن. خەڵکی مەڵتییە لەمەبەستی ئەوان ئاگادار بوونەوە و هەموویانیان کوشت و دەستیان بەسەر سامانەکانی ئەواندا گرت.

لەنیوەی رەبیع الاوەل/ نۆی مەی ئەم ساڵە موسڵ و سەرزەمینەکانی دەوروبەری بەمۆئەنسی سپێردرا.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر کوڕی باوکی داودی سەجستانی و باوکی عوانە یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی ئەسفراینی مردن. باوکی عوانە مسندی لەحەدیسی صحیح گێڕاوەتەوە.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی سەری ناسراو بەکوڕی سەراج، نوسەری کتێبی (اصول فی النحو) مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفدەی کۆچی ( ٩٣٠ زایینی )

## لابردنی موقتەدر لەخەلافەت

لەم ساڵەدا موقتەدر باللە لەخەلافەت دوورخرایەوە و هەموان بەخەلافەتی براکەی قاهر باللە محەممەد کوڕی موعتەزید ڕازی بوون بەڵام دوای دوو ڕۆژ موقتەدر بۆ سەر تەختی خەلافەت گەڕایەوە.

هۆکاری ئەم کارە وەك لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی پێشوو ئاماژەمان پێدا، ڕەم کردنی مونس و ڕۆشتنی ئەو بۆ شەماسییە بوو. فەرماندەی پاسەوانەکان، نازوك، پەیوەستی ئوردووەکەی بوو و باوکی هەیجا کوڕی حەمدانیش لەشاری جەبەل بوو بەیەکێك لەسەرکردەکانی ئەو. بەهەمان شێوە بەنی کوڕی نەفیسیش چوونکە موقتەدر دینەوەری لێ سەندبوویەوە و فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی لەو کاتەدا بەمونس سپاردبوو.

موقتەدر، هارون کوڕی غەریب، ئەحمەد کوڕی کەیغەلەغ، دەستەیەك لەکۆیلە بەردهاوێژەکان و پیادە و کەسانی دیکەی لەناو کۆشکەکەی خۆیدا کۆکردەوە. لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا، زۆربەی ئەو کەسانەی لای موقتەدر بوون، بەرەو ئوردووگاکەی مونس بەڕێکەوتن. ئەم پێشهاتە لەسەرەتاکانی موحەرەم/ فەوریە ڕوویدا.

مونس لەنامەیەك بۆ موقتەدر نووسی کەسوپا لەپەرێشانی و بڵاو کردنەوەی سامان و دارایی و زەوی لەنێوان کۆیلە و کەسانی ناو پەردەی کۆشکی خەلافەت و خۆتێهەڵقورتاندنی ئەوان لەکاروباری وڵات، نارازییە و هەموان داوا دەکەن خەلیفە ئەوان لەکۆشکەکەی خۆی دوور بخاتەوە و دەست بەسەر زەوی و سامانی ئەواندا بگرێت. هەروەها دەبێت هارون کوڕی غەریب ئەلخال لەکۆشکەکەی خۆی دەربکات.

موقتەدر وەڵامی دایەوە تا ئەو جێگەی بتوانێت ئەو کارە ئەنجام دەدات و بەوەی هیچ ڕێگە چارەیەکی نییە، بەسەندە دەکات. موقتەدر ڕێگەی خۆشەویستی

و سازانی لەگەڵ ئەوان گرتەبەر و بەیعەتی چەندین بارەی خۆی بیرخستنەوە و ئەوانی لەئەنجامی پەیمان شکێنی ترساند. فەرمانی بەهاورندا لەبەغداد بڕوات و سنورەکانی شام و جەزیرەی پێسپارد. هارون لەنۆی موحەرەم/ بیست و سێی فەوریەی ئەم ساڵە بەغدادی بەجێهێشت. موقتەدر پێشکەشی و چاکییەکانی خۆی بیرخستنەوە و ئەوانی لەناسپاسی کردن و هەوڵدان بۆ خراپەکاری و ئاژاوە گێڕی ئاگادار کردەوە.

کاتێك موقتەدر بەداواکانی ئەوان رازی بوو، مونس و کوڕی حەمدان و نازوك هاتنە بەغداد. لەناو خەڵکان بڵاو بوویەوە کەمونس و هاوەڵانی خوازیاری لابردنی موقتەدر و هێنانە سەرکاری کەسێکی دیکەن. لەدوانزەی موحەرەم/ بیست و شەشی فەوریە، مونس و سوپاکەی بەرەو شەماسییە بەرێکەوتن و کاژێرێك راوێژیان کرد و هەموان بەرەو کۆشکی خەلیفە گەڕانەوە. کاتێك لەکۆشك نزیك کەوتنەوە، موزەفەر کوڕی یاقوت و کۆیلەکان و دەست و پێوەندەکان و سەرپەرەستی خوان و کەسانی ناو کۆشك هەڵاتن. باوکی عەلی کوڕی موقلە کە لەکۆشکدا بوو، هەڵات و مونس لەگەڵ سوپاکەی ڕۆشتە ناو کۆشکی خەلیفە و موقتەدر لەگەڵ دایکی، پوری، کەنیزەکان، منداڵەکان و کەسە تایبەتییەکان لەکۆشك برانەدەر. ئەوانیان بردە ماڵی مونس و لەوێ زیندانیان کرد.

هارون کوڕی غەریب لەقەتەربول لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە. ئەو بەشێوەیەکی نهێنی هاتە بەغداد. کوڕی حەمدان بەرەو ماڵی کوڕی تاهیر بەرێکەوت و محەممەد کوڕی موعتەزیدی هێنا و دەستی بەیعەتی بۆ درێژ کرد و نازناوی قاهربالله یان پێ بەخشی. قازی، باوکی عومەریان هێنایە لای موقتەدر تا شایەتی لەسەر کار لابرانی موقتەدر بێت. مونس، نازوك، کوڕی حەمدان و بەنی کوڕی نەفیس هەموویان ئامادە بوون. مونس بەموقتەدری وت دەست لەخەلافەت هەڵگرێت و قازی بۆ ئەم کارە کردە شایەت. لەم کاتەدا کوڕی حەمدان هەستا و بەموقتەدری وت: سەروەرم بۆ من دژوارە تۆ لەم بارودۆخەدا دەبینم، ئەمە ئەو شتە بوو لێی دەترسام و ئاگادارم دەکردیتەوە و باشەی تۆم دەویست و تۆم لەدەرئەنجامی راوێژ کردن لەگەڵ کۆیلەکان و ژنەکان ئاگادار کردەوە بەلام تۆ

گرنگیت بەقسەکانی ئەواندا، من چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەم دەکرد، بەهەرحاڵ ئێمە بەندە و کۆیلەی تۆین. بەوتنی ئەم وتانە فرمێسك لەچاوی هەردووکیان هاتەخوار و دەستەیەك بۆ دەست لەکارکێشانەوەی ئەو بوونە شایەت و نامەی دەستە لەکار کێشانەوەیان خستە بەر دەستی قازی باوکی عومەر. باوکی عومەر ئەم نامەی هەڵگرت و نیشانی کەسی نەدا و کاتێك موقتەدر بۆ خەلافەت گەڕایەوە، نامەکەی بۆ موقتەدر گەڕاندەوە و وتی کەسی لەم نامە ئاگادار نەکردۆتەوە. موقتەدر کارەکەی پەسەند وەك بەقازی قازییەکان دەستنیشانی کرد.

کاتێك بارودۆخی قاهیر سەقامگیر بوو، مونسی موزەفەر، عەلی کوڕی عیسای لەزیندان هێنایەدەر و باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەك وەزیر دەستنیشان کرد و جگە لەپاسەوانەکان، پەردەدارانی ناو کۆشکی خەلیفەی خستە ژێر فەرمانی نازوك و ئەم فەرمانەی بۆ هەموو شوێنەکان نووسی. مونس جگە لەو سنورانەی لەژێر دەستی کوڕی حەمداندابوو، حولوان، دەینەوەر، هەمەدان، کەنکور، کرمان، شاهان، رازنات، دەقوقا، خانیجار، نەهاوەند، سەیمەرە، سیروان، ماسبەزان و شوێنەکانی دیکەی خستە ژێر فەرمانی ئەو. بەنی کوڕی نەفیس ڕۆشتە ئەو گۆڕەی بۆ دایکی موقتەدریان ئامادە کردبوو و شەشسەد هەزار دیناری لێ دەرهێنا و گەڕاندییەوە بۆ کۆشك.،

لابردنی موقتەدر لەنیوەی موحەرەم/ بیست و نۆی فەوریە ڕوویدا و دواتر تالآنکاری کۆچی کرد و ئاژاوە دامرکایەوە. کاتێك نازوك فەرماندەیی دەرگاوان و پەردەدارانی خەلیفەی گرتەدەست، فەرمانی بەپیادەکان (مصافیە)دا خێوەتەکانی خۆیان لەکۆشکی خەلیفە کۆبکەنەوە. فەرمانی بەپیاوەکانی خۆیدا لەشوێنی پیادەکان نیشتەجێ بن. ئەو فەرمانی بەسەرپەرەستی پەردەداراندا ڕێگەی چوونەژوور بۆ ناو کۆشك بەکەس نەدەن مەگەر ئەو کەسەی پێگەی بەرزی هەیە. بەم شێوەیە بارودۆخی پەردەداران پەرێشان بوو.

## گەڕانەوەی موقتەدر بۆ خەلافەت

لەرۆژی دووشەممە حەقدەی موحەڕەم/ یەکی مارس خەڵك لەبەرەبەیان لەبەردەم کۆشکی خەلیفە کۆبوونەوە چوونکە یەکەم رۆژ بوو بەناو سوارەکانی حکومەتی تازەدا دەگەڕان. هەموو پیادەڕەوەکان، رێڕەوەکان و گۆڕەپانەکان و کەنارەکانی دیجلە لێوانلێو لەسەیرکەر بوو. هێزە پیادەکان سەراپا چەکدار بوون و ماڧی بەیعەت و رۆژانەی یەك ساڵیان دەویست چوونکە لەکردەوەکانی نازوك پەرێشان و ترساو بوون. مونس لەم رۆژەدا نەبینرا.

دەنگی خەڵکان بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە و بەگوێی نازوك گەیشت و ئەوەندی نەما بوو لەنێوان ئەم دەستەیە و هاوەڵە تایبەتییەکانی نازوك جەنگ روویدات بەلام نازوك فەرمانی بەهاوەڵانیدا وەڵامی خەڵکان نەدەنەوە و جەنگیان لەگەڵ نەکەن. بەم شێوەیە دەنگەدەنگی خەڵکان زیادی کرد و هێرشیان کردە سەر ماڵی تەسعینی.[١٧] هاوەڵانی نازوك رێگەیان لێ نەگرتن. هەرکەس لەکەنارەکانی دیجلە بوو، بەکەرەستەی جەنگ هاتە ناو و دەنگی ئەوان بەگوێی قاهربالله گەیشت. لەم کاتەدا باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەزیر و نازوك و باوکی هەیجا کوڕی حەمدان لای قاهیر بالله بوون. قاهیر بەنازوکی وت: بڕۆ لای ئەوان و ئارامیان بکەرەوە و رەزامەندی ئەوان بەدەست بێنە. نازوك کە لەبەر خواردنەوەی شەوانە مەست و سەرخۆش بوو، ڕۆشتە لای ئەوان. کاتێك خەڵکان ئەویان بینی، هاتنە پێش تا لەرۆژانەی خۆیان سکالا بەرز بکەنەوە. ئەو کاتێك پیاوانی شمشێر بەدەستی بینی کەبەرەو رووی دێن، لەگیانی خۆی ترسا و هەلات و ئەمە بووە هۆی ئەوەی خەڵکان شوێنی کەون. ئەو گەیشتە دەرگایەك کەرۆژی پێشتر خۆی فەرمانی بەستنی ئەو دەرگایەی دابوو. لای ئەم دەرگایە پیاوان پێی گەیشتنەوە و خوێنیان ڕشت. پێشتر کۆیلەکەی ئەو عوجەیبیان کوشت. هاواریان کرد: یا موقتەدر! یا مەنسور! و بەم شێوەیە هەموو کەسانی ناو کۆشك هەلاتن و کۆشك چۆڵ کرا. ئەوان نازوك و

---

[١٧] - بەشوعەیبیش ناوی هاتووە. وەرگێر

عەجیبیان لەداردا و لەشوێنێك هەڵیانواسین كە هەركەس لەكەنارەكانی دیجلە گوزەری دەكرد، ئەوانی دەبینی.

دواتر پیادەكان بەدەنگ و هاوار بەرەو كۆشكی مونس بەرێكەوتن و داوای موقتەدریان كرد. كۆیلەكان پێشدەستییان كرد و دەرگاكانیان بەست. باوكی هەیجا كوڕی حەمدان مەبەستی ڕۆشتنەدەر لەكۆشكی كرد كەقاهیر یەخەی گرت و وتی: من لەپەنای تۆدام. باوكی هەیجا وتی: سوێند بەخوا هیچ كات بەتەنیا جێت ناهێڵم. دەستی قاهیری گرت و وتی: هەستە تا پێكەوە بڕۆین و داوا لەهاوەڵانی من و خۆت بكە شان بەشانی تۆ بجەنگن.

هەردووكیان هەستان بۆ ئەوەی بڕۆنەدەر بەڵام بینیان هەموو دەرگاكان بەستراون. فائق وەجە ئەلقەسعە پەیوەستی ئەوان بوو. قاهیر لەسەرەوەی كۆشكەكە ژمارەی زۆری خەڵكانی بینی و لەگەڵ كوڕی حەمدان و فائق هاتەخوار. كوڕی حەمدان بەقاهیری وت: لێرە چاوەڕوان بە تا دەگەڕێمەوە. ئەو جلە ڕەشەكانی خۆی داكەند و جل و بەرگی پەشمینی كۆیلەیەكی لەبەر كرد و بەرەو دەرگای نوبی ڕۆشت بەڵام بینی داخراوە چوونكە خەڵكان لەپشت دەرگاكە كەڵەكە ببوون. كوڕی حەمدان بەناچاری بۆ لای قاهیر گەڕایەوە. وەجە ئەلقەسعە و كۆیلەكانی درەنگتر لەوان هاتن. ئەو فەرمانی بەكۆیلەكانی خۆیدا بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی موقتەدر و ئەوەی ئەم دووانە لەگەڵ ئەو كردیان، خوێنی هەردووكیان بڕێژن. دەكەس لەكۆیلەكان شمشێر بەدەست هێرشیان كردە سەر قاهیر و كوڕی حەمدان. باوی هەیجا شمشێر بەدەست ڕووبەڕوویان بوویەوە و جل و بەرگە پەشمینەكەی خۆی داكەند و هاوشێوەی قەڵغان لەدەستەكەی دیكەی ئالاند و پەلاماریدان. ئەوان بەخێرایی هەڵاتن و باوكی هەیجا شوێنیان كەوت. ئەوان بەناچاری تیریان بۆ هاویشت. باوكی هەیجا دەستی لێ هەڵگرتن و قاهیر بەتەنیا مایەوە و بەناچاری لەدواوەی باخەكە خۆی شاردەوە.

باوكی هەیجا لەماڵی ساگ پەنای گرت. كۆیلەكان لەو ماڵە نزیك كەوتنەوە بەڵام كاتێك باوكی هەیجا هێرشی كردنەسەر، هەموویان هەڵاتن. لەم ناوەدا چەند كەسێكی بەردهاوێژ مەبەستی باوكی هەیجایان كرد. دوو كۆیلەی ڕەشی شمشێر

بەدەست هاورێیەتی باوکی هەیجایان دەکرد. هێرشبەران پەلاماری باوکی هەیجایاندا و باوکی هەیجا تیری بەرکەوت و لەشوێنەکەی کەوت. یەکێك لەهێرشبەران گەیشتە سەری و دەستی بەشمشێر بڕی و سەری لەجەستەی جیا کردەوە و لەگەڵ خۆی بردی. ئەو سەری باوکی هەیجای لەدەستدا بوو و دەستەیەك لەکۆیلەکان شان بەشانی ئەو دەڕۆشتن.

کاتێك پیادەکان گەیشتنە ماڵی مونس و مونس دەنگی ئەوانی بیست، وتی: چیتان دەوێت.؟ پێیان وت: موقتەدرمان دەوێت. فەرمانیدا موقتەدر نیشانی ئەوان بدەن. کاتێك بەموقتەدریان وت بڕواتە لای ئەوان، ترسا لەوەی نەکا بیریان لەکوشتنی ئەو کردبێتەوە، بۆیە بەڕۆشتن رازی نەبوو. ئەویان هێنایەدەر. پیادەکان ئەویان خستە سەر شان و بردیانە ناو کۆشك. کاتێك گەیشتە ماڵی تەسعینی، دڵی ئارام بوویەوە و لەسوچێکدا دانیشت و پرسیاری بارودۆخی قاهیر و کوڕی حەمدانی کرد. پێی وترا هەردووکیان زیندون. ئەو بەدەستی خۆی ئەمان نامەیەکی بۆ هەردووکیان نووسی و فەرمانی بەکۆیلەیەکدا بەپەلە نامەکەیان بۆ ببات بۆ ئەوەی هیچ بەلایەك بەسەر باوکی هەیجا نەیێت. کۆیلە لەگەڵ نامەکەی موقتەدر دەڕۆشت کەکۆیلەیەکی دیکەی بینی کەسەری باوکی هەیجای بەدەستەوە بوو. لەگەڵ ئەم کۆیلە گەڕایەوە. کاتێك موقتەدر کۆیلەکەی بینی و ئەوی لەمەرگی باوکی هەیجا ئاگادار کردەوە، وتی: هەموان لەلایەن خواوەندەوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە، کێ ئەوی کوشت؟ کۆیلە وتی: بکوژەکەی ناناسین. موقتەدر مەرگی باوکی هەیجای پێ ناخۆش بوو، وتی: لەم رۆژانەدا جگە لەو کەس نەیدەتوانی دڵی من ئارام بکاتەوە و خەمەکانی من نەهێڵێت.

دواتر قاهیریان گرت و بردیانە لای موقتەدر. موقتەدر، ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و لای خۆی داینیشاند، ناوچاوانی ماچ کرد و پێی وت: براکەم! دەزانم گوناحی تۆ نییە و تۆیان بۆ ئەم کارە ناچار کرد و ئەگەر نازناوی (مقهور)یان پێ دەبەخشی باشتر بوو لەوەی بەقاهیر ناوت ببەن. قاهیر دەگریا و دەیوت: ئەی سەروەری باوەڕداران، بیری پەیوەندی خۆم و تۆ دەکەمەوە. موقتەدر پێی وت: سوێند بەخواوەند و پێغەمبەر(د.خ)، هیچ کات خراپە لەمنەوە بەتۆ ناگات و تا من

زیندووم کەس ئازاری تۆ نادات. قاهیر ئارام بوویەوە. لەم کاتەدا سەری نازوك و باوکی هەیجایان هێنا و هاواریان کرد: ئەمەیە سزای ئەو کەسەی سەرپێچی فەرمانەکانی سەروەری باوەڕداران دەکات.

بەنی کوڕی قەیس کە لەخراپەخوازترینی خەڵکان بۆ موقتەدر بوو، کاتێك لەگەڕانەوەی ئەو بۆ خەلافەت ئاگادار بوویەوە، جل و بەرگەکانی گۆڕی و سوار ئەسپەکەی خۆی لەبەغداد هەڵات و خۆی گەیاندە موسڵ و لەوێوە ڕێگەی ئەرمەنستانی گرتەبەر و تا قوستەنتەنییە نەوەستایەوە و لەوێ باوەری بەئایینی مەسیحییەت هێنا.

باوکی سەرایا نەسر کوڕی حەمدان برای باوکی هەیجا بۆ موسڵ هەڵات و شۆڕش دامرکایەوە. موقتەدر، باوکی عەلی کوڕی موقلەی بۆ وەزارەت گەڕاندەوە و ئەم فەرمانەی بۆ هەموو ناوچەکان نووسی. دووبارە ڕۆژانە و توێشوی سوپاییەکانیدا و کالاَ و گەوهەرەکانی گەنجینەی فرۆشت و مۆڵەتیدا زەوییەکانی حکومەت بەخەڵکان بفرۆشن و ئەم زەوییانەیان بەهەرزانترین نرخ بەخەڵکان فرۆشت بۆ ئەوەی بتوانێت پارەی سوپا بدات.

دەوترا مونسی موزەفەر لەلابردنی موقتەدر هیچ دەورێکی نەبوو و چوونکە کەس گوێی لەوتەکانی نەدەگرت، لەگەڵ ئەوان یەکیگرت. لەلایەك دەیزانی ناسازگاری لەگەڵ ئەوان هیچ سوودێك بەموقتەدر ناگەیێنێت و بۆیە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا تا گیانی موقتەدر بپارێزێت. بەردەوام هانی پیادە و بەرهاوێژەکانی دەدا و سەرکردەکانی ئەوانی بەگەڕاندنەوەی موقتەدر بۆ خەلافەت ناچار کرد. ئەو کاتێك لەکۆشکی موقتەدر بوو،پێی وتبوو: دەخوازیت چی بکەین.؟ لەبەر ئەمە موقتەدر ئەوی بەکەسێکی بڕواپێکراو دەزانی. و کاتێك ئەویان لەماڵی مونسەوە بۆ کۆشکی خەلیفە برد و موقتەدر لەکۆشك فراوانی خەڵکان و ناسازگای ئەوانی بینی، لەسەر بنەمای باوەڕی بەمونس بۆ ماڵەکەی ئەو گەڕایەوە. ئەگەر ئەم باوەڕە نەدەبوو، لەگەڵ دەستەکەی دەڕۆشتە بارەگای قاهیر بەلاَم وەك وتمان لەگەڵ ئەوان نەڕۆشت.

موقتەدر، قاهیری لای دایکی هێشتەوە و دایکی، دڵنەوایی کرد و پارەیەکی

فراوانی خستە بەردەستی. بۆ ئەنجامدانی کارەکانی قاهیر، چەندین کەنیزیان کڕی. دایکی، لەچاکە کردن لەگەڵ ئەو زێدەڕۆیی دەکرد.

## (( هێرشی قەرەمتییەکان بۆ مەککە و کردەوەی ئەوان لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە و حاجییەکانی مەککە و هەڵکەندنی حجر الاسود ))

لەم ساڵەدا مەنسوری دەیلەمی سەرپەرەستی حاجییەکان بوو و ئەوانی لەبەغدادەوە بەرەو مەککە برد. لەرێگەی رووبەرووی هیچ گرفتارییەك نەبوونەوە بەڵام لەرۆژی ترویە باوکی تاهیری قەرەمتی هاتە ناو مەککە و لەگەڵ سوپاکەی سامانی حاجییەکانی تالآن کرد و لەمسجد حەرام و تەنانەت لەناو ماڵی خوا، حاجییەکانی کوشت و حەجەر ئەلئەسوەدی هەڵکەند و لەگەڵ خۆی بردییە هەجەر. کوڕی موحەلیبی فەرمانڕەوای مەککە لەگەڵ دەستەیەك لەگەورەکان رۆشتنە لای باوکی تاهیر وداوای سامانی حاجییەکانیان لێکرد بەڵام باوکی تاهیر بەنێوەنجیگەری ئەوان رازی نەبوو و رووبەروویان بوویەوە و ئەوانی کوشت و دەرگای ماڵی خواوەندی هەڵکەند و پیاوێکی بالأبەرزی نارد تا ستوونەکانیشی هەڵکەنێت بەڵام ئەو پیاوە ژێرکەوت و مرد. کوژراوەکان فڕێدرانە ناو چاڵی زەمزەم و کەسانی دیکەی بێ ئەوەی کفن بکرێن لەمسجد ئەلحەرام بەخاك سپێردران. جەنازەی ئەم دەستەیە نەشۆردرا و کەس نوێژی لەسەر نەخوێندن. باوکی تاهیر راخەرەکانی ماڵی خواوەندی هەڵگرت و لەناو هاورێکانی خۆی دابەشی کرد. بەهەمان شێوە ماڵی دانیشتوانی مەککە تالآن کرا.

کاتێك هەواڵی ئەم کارە بەمەهدی باوکی عوبەیداللەی عەلەوی لەئەفریقییە گەیشت، نامەیەکی بۆ باوکی تاهیر نووسی و ئەم کارەی ئەوی بە قێزەون لەقەڵەمدا و سەرکۆنە و نفرینی کرد. مەهدی لەنامەکەی خۆیدا نووسی: تۆ بەم کارەت ناوی کفر و بێ دینیت بەسەر ناوچاوانی شوێنکەوتەکانی ئێمە سەپاند وئەگەر سامانە تالآن کراوەکانی خەڵکانی مەککە نەگەڕێنیتەوە و حەجەر ئەلئەسوەد نەبەیتەوە شوێنی خۆی و راخەرەکان لەناو ماڵی خوادا رانەخەیتەوە، لەم دنیا و لەو دنیا

لەتۆ بەدوورم.

کاتێك ئەم نامەیە بەدەستی باوکی تاهیر گەیشت، بڕیاریدا بەردی ڕەش – ئاماژەی پێدەدەین– بۆ شوێنی خۆی بگەڕێنیتەوە و سامانی خەڵکان بداتەوە. ئەو وتی: ئەم دەستەیە راخەرەکان و بەشێك لەسامانەکەیان لەناو خۆیاندا دابەش کردووە و من نەمتوانی ڕێگەی ئەو کارەیان لیّ بگرم.

## شۆڕشی باوکی زەکەریا و براکانی ئەو لەخوراسان

لەم ساڵەدا باوکی زەکەریا یەحیا، باوکی ساڵحی مەنسور و باوکی ئیسحاق منداڵەکانی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی دژی براکەیان سەعید کوڕی نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی شۆڕشیان کرد. دەڵێن ئەم شۆڕشە لەساڵی ٩٣١/٣١٨ زایینی روویداوە کەئەمە راستە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: براکەی ئەوان نەسر، هەموویانی لەقەهندزی بوخارا زیندانی و پاسەوانی بۆ دانابوون. براکانی نەسر لەزیندان رزگاریان بوو. چۆنیەتی رزگاری ئەوان بەم شێوە بوو کەپیاوێك ناسراو بەئەبوبەکری خوبازی (نانەوا) ئیسفەهانی هەرکات ناوی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد دەهێنرا، دەیوت: ڕۆژێکی لێوانلێو لەڕەنج و دژواری لەمنەوە پێدەگات. خەڵك بەقسەکانی ئەو پێدەکەنین. ڕۆژێك سەعید نەسر روویکردە نەیشابور و باوکی عەباسی کوسجی وەك جێگری خۆی لەبوخارا بەجێهێشت. مانگانەی براکانی نەسر لەسەر دەست ئەبوبەکری نانەوا بەوان دەگەیشت. ئەبوبەکر بڕیاریدا لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان یەکبگرێت و ئەوان لەزیندان رزگار بکات. سوپاییەکان رەزامەندی خۆیان نیشاندا و ئەبوبەکر، براکانی نەسری لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار کردەوە.

کاتێك سەعید لەبوخارا ڕۆشت، ئەم دەستەیە ڕۆژی هەینیان بۆ کۆبوونەوەی خۆیان لای دەروازەی قەهندز دەستنیشان کرد. نەریت بەو شێوە بوو دەروازەی قەهندز لەڕۆژانی هەینییە نەدەکرایەوە مەگەر ئێواران. لەڕۆژی پێنجشەممە ئەبوبەکری نانەوا ڕۆشتە قەهندز و ئەمە ڕۆژێك پێش ئەو هەینی دیاریکراو بوو. نانەوا هاتە لای دەروازەی قەهندز و وەك کەسێکی خۆپارێز و لەخوا ترس خۆی

نیشانی پاسەواندا. پێنج دیناری پێدا بۆ ئەوەی دەروازەکەی بۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی نوێژەکەی نەچێت. پاسەوان دەروازەکەی بۆ کردەوە. لەم کاتەدا ئەبوبەکر ئەو سوپاییانەی بانگ کرد کەبۆ رزگار کردنی براکانی نەسر بەڵێن و پەیمانیان بەستبوو. ئەوان کەلای دەروازەکە چاوەڕوانی ئەبوبەکری نانەوایان دەکرد، وەڵامیان دایەوە و پاسەوانی دەروازەکەیان گرت و خۆیان گەیاندە زیندانەکە و یەحیا و مەنسور و ئیبراهیم، منداڵەکانی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلیان لەزیندان هێنایەدەر. ئەم دەستەیە هەموو دەیلەمییەکان، عەلەوییەکان و بەهادورەکانیان ئازاد کرد و هەمووی ئەوان لەگەڵ سوپاییەکان لەدەوری براکانی نەسر کۆبوونەوە. شەروینی جەیلی و چەند سەرکردەیەکی دیکە، سەرۆکایەتی ئەم دەستەیان دەکرد. پێگەی ئەم دەستەیە بەرز بوویەوە و گەنجینەکانی سەعید نەسر و ماڵ و کۆشکەکانی ئەویان تالان کرد. یەحیا کوڕی ئەحمەد، ئەبوبەکری نانەوای پێش کەسانی دیکە خست و وەك فەرماندە دەستنیشانی کرد. سەعید لەم کاتەدا لەنەیشابور بوو و ئەبوبەکر محەممەد کوڕی موزەفەر، فەرماندەی سوپای خوراسان، لەجورجان دەژیا. کاتێك یەحیا شۆڕشی دەستپێکرد و سەعید لەنەیشابور ئەم هەواڵەی بیست، بۆ بوخارا گەڕایەوە. محەممەد کوڕی موزەفەر لەم رووداوە ئاگادار کرایەوە. ئەو نامەی بۆ ماکان کوڕی کالی نووسی و ئەوی وەك زاوای خۆی هەڵبژارد و نەیشابوری خستە ژێر فەرمانی ئەو. ماکان بەرەو نەیشابور بەرێکەوت. سەعید لەنەیشابورەوە رێگەی بوخارای گرتەبەر. یەحیا، ئەبوبەکری نانەوای بۆ پارێزگاری کردنی رووبارەکە راسپاردبوو. سەعید ئەوی گرت و لەرووبارەکە بەرەو بوخارا کەوتەرێ. ئەو لەئەشکەنجەدای ئەبوبەکری نانەوا زێدەڕۆیی کرد. ئەوی خستە ناو تەنورێك و سووتاندی.

یەحیا لەبوخاراوە رێگەی سەمەرقەندی گرتەبەر و لەکەنارەکانی سەغانییان کە لەژێر فەرمانی باوکی عەلی کوڕی ئەبوبەکر محەممەد کوڕی موزەفەر بوو، گوزەری کرد و لەوێوە رێگەی تەرموزی گرتەبەر و لەرووبارەکەوە رێگەی بەڵخی بڕی کە لەژێر فەرمانی قەراتکیندا بوو. قەراتکین پەیوەستی بوو و هەردووکیان بەرەو مەرو بەرێکەوتن. کاتێك محەممەد کوڕی موزەفەر هاتە نەیشابور، یەحیا نامەی بۆ

نووسی و محەممەد ڕێزی گرت و وای نیشاندا خوازیاری پەیوەست بوون بەوە و بەڵێنی پێدا بەرەو لای ئەو دەڕوات و پەیوەستی دەبێت. دواتر لەنەیشابورەوە بەرێکەوت و ماکان کوڕی کالی وەك جێگری خۆی لەنەیشابور بەجێهێشت و وای نیشاندا دەخوازێت بەرەو مەرو بڕوات. دواتر بەخێرایی ڕێگەی بوشەنج و هەراتی ناوقەدبڕ کرد و دەستی بەسەر ئەو دوو شارەدا گرت. محەممەد لەهەراتەوە، لەڕێگەی غەرشتسان هێرشی کردە سەر سەغانییەکان. یەحیا لەکارەکانی ئەو ئاگادار بوویەوە و دەستەیەکی بۆ سەر ڕێگەی ئەوە نارد. محەممەد ڕووبەڕوویان بوویەوە و شکستی پێهێنان و لەڕێگەی غەرشستانەوە درێژەی بەپێشڕەوی خۆیدا و لەکوڕەکەی باوکی عەلی کە لەسەغانییان بوو، داوای هاوکاری کرد. ئەو بەسوپایەك هاوکاری محەممەدی کرد. محەممەد کوڕی موزەفەر گەیشتە بەلْخ کە لەژێر فەرمانی مەنسور کوڕی قەراتکیندا بوو. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ئاگری شەڕێکی مەترسیدار هەڵگیرسا. مەنسور بۆ جوزجان هەڵات و محەممەد ڕێگەی سەغانیانی گرتەبەر و خۆی گەیاندە کوڕەکەی و ئەم هەواڵەی بۆ سەعید نووسی. سەعید شادمانی خۆی دەربڕی و بەلْخ و تەخارستانی خستە ژێر فەرمانی ئەو و بۆ سەردان کردنی خۆی بانگی کرد. محەممەد ئەم دوو شارەی بەکوڕەکەی باوکی عەلی ئەحمەد سپارد و ئەوی بۆ ئەم دوو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. محەممەد ڕۆشتە بارەگای سەعید و هەردووك لەبەلْخ بەیەك گەیشتن. سەعید، شوێنپێی یەحیای لەهەرات هەڵگرت.

یەحیا بەرەو نەیشابور کە لەژێر فەرمانی ماکان کوڕی کالیدا بوو، بەرێکەوت. ماکان ڕێگەی لێگرت و سوپاکەی یەحیا نەیتوانی دەست بەسەر نەیشابوردا بگرێت. محەممەد کوڕی ئەلیاس کەهاوڕێی یەحیا بوو، داوای ئەمانی لەماکان کرد و مەنسور و ئیبراهیم دوو براکەی یەحیا، داوای ئەمانیان لەنەسری برایان کرد و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشاندا. کاتێك سەعید لەهەرات نزیك کەوتەوە کەیەحیا و قەراتکینی لیْ بوو، ئەو دووانە هەردووك هەراتیان بەجێهێشت و هەڵاتن. قەراتکین بۆ ڕزگار بوون لەدەستی سەعید بیری لەفرت و فێڵ کردەوە و یەحیای لەبەلْخەوە بۆ بوخارا نارد و خۆی لەبەلْخ مایەوە. سەعید ڕێگەی بوخارای

گرتەبەر و کاتێك سەعید لەڕووبار پەڕییەوە، یەحیا لەبوخاراوە بەرەو سەمەرقەند هەڵات بەڵام چیتر قەراتکین هاوکاری نەکرد و بەم شێوەیە ڕێگەی نەیشابوری گرتەبەر. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی ئەلیاس پێگەی بەرز ببوویەوە و ماکان لەجورجان ژیانی بەسەر دەبرد. محەممەد کوڕی ئەلیاس پەیوەستی بوو و بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە و لەنەیشابور مانەوە.

شوێنکەوتنی یەحیا لەلایەن سەعیدەوە، ڕێگەی نەدەدا یەحیا لەیەك شوێن بمێنێتەوە. کاتێك لەهاتنی سەعید بۆ نەیشابور ئاگادار بوونەوە، بڵاوەیان لێکرد و کوڕی ئەلیاس ڕوویکردە کرمان و لەوێ مایەوە و قەراتکین لەگەڵ یەحیا ڕوویان کرد بوست و ڕوخج و لەوێ نیشتەجێ بوون. نەسر کوڕی ئەحمەد لەساڵی ٩٣٣/٣٢٠ زایینی گەیشتە نەیشابور و پەیکی بۆ لای قەراتکین نارد و بەڵخی خستە ژێر فەرمانی ئەو و ئەمانی بەیەحیا بەخشی. قەراتکین هاتە لای و ئاگری جەنگ دامرکایەوە.

سەعید لەنەیشابور مایەوە تا یەحیا هاتە لای. سەعید، ڕێزی گرت و دڵنەوایی و چاکەی لەگەڵ کرد. دواتر ئەو و براکەی باوکی ساڵحی مەنسور درێژەیان بەڕێگەی خۆیاندا بەڵام براکەی دیکەیان، ئیبراهیم، لای سەعید بۆ بەغداد هەڵات و لەوێوە ڕۆشتە موسڵ و بەخواستی خواوەند دواتر ئاماژە بەگێڕانەوەکانی تایبەت بەو دەدەین.

قەراتکین لەبوست مرد و جەنازەی ئەویان بۆ ئەسبیجاب برد و لەڕەبات ناسراو بەرەباتی قەراتکین بەخاك سپێردرا. ئەو هیچ کات خاوەنی زەوی نەبوو. دەیوت: سەربازێك دەبێت هەموو شتەکانی خۆی هەمیشە پێ بێت تا هیچ شتێك پێبەندی نەکات.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەنیوەی موحەرەم/ یەکی مارسی ئەم ساڵە لەنێوان بەقاڵ و عەتار و بەزازەکان ئاژاوە سەری هەڵدا. بەقاڵەکان لەسەرەتای ڕۆژ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و پێلاودوورەکان پەیوەستی عەتار و بەزازەکان بوون و هاوکارییان کردن و بەسەر بەقاڵەکاندا سەرکەوتن و شکستیان پێهێنان و بازارەکانی تایبەت بەوانیان سوتاند.

دوای ئەم ڕووداوە ئاژاوە درێژەی کێشا و خراپەکاران بوێر بوون و دەستگێر و پێلاو دوورەکان دژی بەقاڵەکان یەکیانگرت و شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان هاتە ئاراوە. بەقاڵەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و بازارەکانی ئەوانیان سووتاند و ژمارەیەکیان کوشت. فەرمانڕەوای موسڵ، حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدان کەدواتر نازناوی ناسر ئەلدەولەی پێبڕا، سوار ئەسپەکەی بوو بۆ ئەوەی خەڵکان ئارام بکاتەوە بەڵام ئەوان لەسەر جەنگ و ئاژاوە پێداگرییان دەکرد. سەرئەنجام ژمارەیەك لەشارەزایانی ئایینی نێوەنجیگەرییان کرد و ئەوانیان ئاشت کردەوە.

لەم ساڵەدا لەنێوان هاوەڵانی ئەبوبەکری مەروزی حەنبەلی و خەڵکانی دیکەی بەغداد ئاژاوەیەك سەریهەڵدا و ژمارەیەك لەسەربازەکان خۆیان خستە ناو ئەم ئاژاوە. هۆکاری ئەم ئاژاوە ئەوە بوو هاوەڵانی مەروزی لەلێکدانەوەی ئەم فەرموودەی خواوەند: هیوادار بە کەخواوەند تۆ بۆ پێ یەکی وەسف کراو بەرز بکاتەوە،[18] دەیانوت: خواوەند، پێغەمبەر(د.خ) دەخاتە ەر عەرشەکەی خۆی و دەستەیەکی دیکە دەیانوت: مەبەستی ئەم ئایە شەفاعەتە. لەنێوان ئەم دوو دەستەیە ئاژاوە سەری هەڵدا و بۆ کوشتنی یەك دەستیان بۆ شمشێر برد و ژمارەیەك لەهەردوو لاکوژران.

لەم ساڵەدا سنورەکانی جەزیرە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕۆمییەکان لاواز بوون. مەڵتییە، مەیافارقین، ئامەد، ئەرزەن و شارەکانی دیکە لەناو ئەم سنورەدا بوون. ئەم شارانە لەبەر ناتەوانی موقتەدر لەهاوکاری کردن، مەبەستی ئەوەیان کرد

---

[18] - اسراء/ ٧٦ : عسى ان يبعثك ربك مقاما محمودا.

ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی پاشای ڕۆم دەربڕن. ئەوان کەسیان بۆ بەغداد نارد بۆ ئەوەی شارەکانی خۆیان تەسلیم بەرۆمییەکان بکەن و ناتەوانی خۆیان بۆ پارێزگاری کردن لەشارەکان هێنایە سەرزمان. ئەوان بۆ دوور کردنەوەی رۆمییەکان داوای سوپایان لەبەغداد کرد بەلاَم بیَ ئەنجام گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عومەر محەممەد کوڕی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی حیماد کوڕی زەید وەك قازی قازییەکان دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا دوو کوڕی رائیق لەجێگەی نازوك وەك فەرماندەی پاسەوانەکان دیاریکران.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی مەنبەع مرد. ساڵی لەدایك بوونی ئەو ٨٢٩/٢١٤ زایینی بوو.

لەم ساڵەدا موقتەدر بۆ ناسر ئەلدەولە حەسەن کوڕی باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان، جگە لەسنورەکانی قەردا و بازەبدا، زەوی و سنورەکانی باوکی خستە ژێر فەرمانی ئەو.

لەم ساڵەدا کەنارەکانی موسڵ بەنەحریری سەغیر سپێردرا و ئەو بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت بەلاَم لەم ساڵەدا مرد و دوای ئەو ناسر ئەلدەولە حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدان لەموحەرەمی ٣١٨/فەوریەی ٩٣٠ جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا عێراقییەکان لەرێگەی شامەوە مەبەستی حەجییان کرد و لەسەرەتای رەمەزان/ هەشتی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە گەیشتنە موسڵ و لەبەر ئەوەی قەرەمتی رێگەی بەستبوو، رێگەی شامیان گرتەبەر. راخەری کەعبە بە کوڕی عەبدوسی جەهشیاری، لەهاوەڵانی وەزیر بوو.

لەشەعبان/ سێپتامبەری ئەم ساڵە پیاوێکی خارجی بەناوی کوڕی مەتەر لەموسڵ دەرکەوت و مەبەستی نەسیبینی کرد. ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان رووبەرووی بوویەوە و ئەسیری کرد. دواتر پیاوێکی خارجی دیکە بەناوی محەممەد کوڕی ساڵح لەبوزایج ئالاَی شۆڕشی بەرز کردەوە و باوکی سەرایا نەسر کوڕی حەمدان رووبەرووی بوویەوە و ئەسیری کرد.

لەم ساڵەدا موفلیحی ساجی رووبەرووی دوموستوق بوویەوە و لەجەنگی نێوان

ئەم دوانە، دوموستوق هەلاَت و موفلیح بەدوای ئەو رۆشتە ناو سەرزەمینی رۆم.

لەکۆتاییەکانی زیقەعدە/ شەشی ژانویەی ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی گەورە (نەیزەك) لەئاسمان کەوتەخوار. روناکی ئەم ئەستێرەیە سەرسورهێنەر بوو.

لەم ساڵەدا بایەکی سەخت لەبەغداد هەڵیکرد و خۆڵێکی سوورەنگی لەگەڵ خۆی هێنا. ئەم بایە هەردوو لای بەغدادی گرتەوە و ماڵەکانی پڕ کرد لەخۆڵ. ئەم خۆڵە هاوشێوەی خۆڵی رێگەی مەککە بوو.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی حەسەن کوڕی فەرەج کوڕی سەقیر، نەحوی تازی، مرد. ئەو لەسەر شێوازی کوفییەکان شارەزای نەحو بوو و چەندین نوسراوی لەدوای خۆی بەجێهێشت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەژدەی کۆچی ( ٩٣٠ زایینی )

## چۆنیەتی لەناوچوونی هێزە پیادەکان ( مصافیە )

لەموحەرەم/ فەرویەی ئەم ساڵە هێزە پیادەکان لەناوچوون و لەبەغداد دەرکران. ئەمە دوای ئەوە بوو خراپەکاری ئەوان زیادی کرد و پێگەیان بەرز بوویەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوەیە بوو: کاتێك ئەوان موقتەدریان بۆ خەلافەت گەڕاندەوە، دەستدرێژی کردنی ئەوان زیادی کرد و ئەو وتانەیان دەهێنایە سەرزمان کەهیچ خەلیفەیەك پێی رازی نەدەبوو. بۆ نمونە دەیانوت: هەرکەس هاوکاری ستەمکەرێك بکات، خواوەند بەسەر ئەواندا زاڵی دەکات، هەرکەس کەرێك بباتە سەربان، دەتوانێت بیهێنێتە خوار، ئەگەر موقتەدر ئەو کارەمان لەگەڵ نەکات، کەشیاوین بۆی، بەو شێوەیە لەگەڵی دەجەنگین کەشیاوە بۆی و وتەی لەم جۆرە.

شۆڕش و داواکاری ئەم دەستەیە زیادی کرد و ناوی بنەماڵە، منالەکان و ئاشناکانی خۆیان لەناو پێرستی ئەو کەسانەدا نووسی کەمانگانەیان وەردەگرت بەشێوەیەك مانگانەی ئەوان گەیشتە سەد و سی هەزار دینار.

بەرێکەوت سوارەکان بۆ وەرگرتنی مانگانەی خۆیان ئاژاوەیان نایەوە، پێیان وترا: گەنجینە خاڵییە و پارەیان بەپیادەکان داوە. سوارەکان دژی پیادەکان شۆڕشیان کرد و جەنگ هەڵگیسرا و ژمارەیەك لەسوارەکان کوژران. موقتەدر کوژرانی ئەم دەستەی کردە بیانو و فەرمانی بەمحەممەد کوڕی یاقوت، فەرماندەی پاسەوانەکاندا پیادەکان لەکۆشك دووربخاتەوە و دەنگیان بەرز کردەوە کەپیادەکان دەبێت لەبەغداد بڕۆنەدەر و ئەگەر کەسێك لەوان لەبەغداد بمێنێتەوە، قۆڵبەست و زیندانی دەکرێت. ماڵی سەرکردەکانی ئەوان روخێنرا و زەوییەکانیان دەستی بەسەردا گیرا و دوای دەنگە دەنگ، دەستەیەك لەوانیان گرت و ریشیان تاشین و ریسوایان کردن.

ڕەشپێستەکان بۆ لایەنگیری کردن لەپیادەکان کەوتنە جموجۆڵ. محەممەد کوڕی یاقوت جارێکی دیکە لەگەڵ بەردهاوێژەکان هێرشی کردنەسەر و ماڵەکانی

ئەوانی سوتاند و ژمارەیەك لەوان لەگەڵ ژن و منداڵەكانیان سووتان. ئەوان بەرەو واست بەڕێكەوتن و ژمارەیەكی زۆر لەوان كۆبوونەوە و دەستیان بەسەر ئەو شارەدا گرت و نوێنەری خەلیفەیان لەو شارە دەرپەڕاند. مونس هێرشی كردە سەریان و ژمارەیەكی زۆری لەوان كوشت و دوای ئەوە چیتر ئاڵای شۆڕشیان بەرز نەكردەوە.

## لابردنی ناسر ئەلدەولە كوڕی حەمدان لەفەرمانڕەوایەتی موسڵ و هاتنە سەركاری دوو كوڕە مامەكەی، سەعید و نەسر

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە ناسر ئەلدەولە حەسەن كوڕی عەبدوللە كوڕی حەمدان لەفەرمانڕەوایەتی موسڵ دوورخرایەوە و دوو كوڕە مامەكەی سەعید و نەسر، منداڵەكانی حەمدان، هاتنە سەركار. ناسر ئەلدەولە، فەرمانڕەوایەتی دیاری رەبیعە، نەسیبین، سنجار، خابور، رەئس عەین، دیاربەكر، میافارقین و ئەرزەنی گرتەدەست و دانی ماڵیاتێكی دیاریكراوی گرتە ئەستۆ و رێگەی ئەم سەرزەمینانەی گرتەبەر. سەعید لەرەبیع الاخر/ مەی گەیشتە موسڵ.

## لابردنی كوڕی موقلە و وەزارەتی سلێمان كوڕی حەسەن

لەم ساڵەدا باوكی عەلی محەممەد كوڕی موقلە لەوەزارەتی خەلیفە دووخرایەوە. هۆكاری لابردنەكەی ئەمە بوو: موقتەدر لەنزیك بوونەوەی ئەو لەمونسی موزەفەر ڕەشبین بوو چوونكە موقتەدر لەمونس دەترسا و بەرواڵەت رێزی دەگرت. رۆژێك مونس رێگەی ئەوانا و عوكبرای گرتەبەر و كوڕی موقلە لەكۆتاییەكانی جومادی الاخر/ یەكی جولای ڕۆشتە كۆشكی موقتەدر و موقتەدر، قۆڵبەستی كرد.

لەنێوان محەممەد كوڕی یاقوت فەرماندەی پاسەوانەكان و كوڕی موقلە دوژمنایەتی لەئارادا بوو. محەممەد كوڕی یاقوت دوای گرتنی كوڕی موقلە كەسی بۆ ماڵەكەی نارد و گڕی تێ بەردا.

موقتەدر دەیویست حسەین كوڕی قاسم وەك وەزیر هەڵبژێرێت بەڵام مونس كە

لەسەفەر گەڕابوویەوە، عەلی کوڕی عیسای بۆ لای موقتەدر نارد و داوای لێکرد کوڕی موقله بۆ وەزارەت بگەڕێنێتەوە بەڵام موقتەدر وەڵامی نەدایەوە و مەبەستی کوشتنی کوڕی موقلەی کرد بەڵام مونس ڕێگەی ئەو کارەی پێنەدا. مونس داوای لەموقتەدر کرد حسەین وەك وەزیر دەستنیشان نەکات. موقتەدر حسەینی پشتگوێ خست و لەنیوەی جومادی الاوەل/ شانزەی جولای سلێمان کوڕی حەسەنی وەك وەزیر دەستنیشان کرد و عەلی کوڕی عیسای وەك چاودێری هەموو دیوانەکان هەڵبژارد و ئەوەی کەسلێمان بێ ئاگادار کردن و ڕاوێژ کردن بەو هیچ کارێك نەکات. دارایی دووسەد هەزار دیناری کوڕی موقله دەستی بەسەردا گیرا. وەزارەتی کوڕی موقله دوو ساڵ و چوار مانگ و سێ ڕۆژ درێژەی کێشا.

## گرتنی مناڵەکانی بورەیدی

مناڵەکانی بورەیدی، باوکی عەبدوللە و باوکی یوسف و باوکی حسەین کەبەلێنی کۆکردنەوەی باجی ئەهوازیان دابوو – پێشتر ئامارژەمان پێدا– دوای لابردنی کوڕی موقله بەفەرمانی موقتەدر بۆ ئەحمەد کوڕی نەسری قەشوری پەردەدار، قۆڵبەست و لەماڵەکەی ئەو زیندانی کران. لەیەکێك لەڕۆژەکان دەنگەدەنگ و هاوارێکی زۆر بیسترا. ئەحمەد کوڕی نەسر سەبارەت بەو دەنگە دەنگە پرسیاری کرد. وتیان: وەزیر نامەی ئازادی مناڵەکانی بورەیدی نووسیوە. باوکی عەبدوللە نامەیەکی درۆینەی نووسیبوو و دەبوا بەپێی ئەو نامەیە مناڵەکانی بورەیدی ئازاد بکرێن وبۆ سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆیان بگەڕێنەوە. ئەحمەد کوڕی نەسر پێی وتن: ئەمە نامەی خەلیفەیە و تیایدا هاتووە: ئەوان ئازاد ناکەیت تا ئەو کاتەی نامەیەك بەخەتی خۆم بەدەستی تۆ دەگات.

دواتر دەرکەوت ئەم نامەیە درۆیینە بووە. موقتەدر ئەوانی بۆ بەغداد بانگ کرد و چوارسەد هەزار دیناری لێسەندن. موقتەدر چاوەڕوانی وەرگرتنی ئەم برە پارە نەبوو، داوای ئەو برەی کرد بۆ ئەوەی بەشێك لەو برە بدەن بەڵام ئەوان هەموو برە پارەکەیان تەسلیم بەموقتەدر کرد بۆ ئەوەی ئازاد بن و بۆ سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆیان بگەڕێنەوە.

## شۆڕشی ساڵح و ئەغور

لەجومادی الاوەل/ جولای ئەم ساڵە، پیاوێکی خارجی لەخەڵکانی بوجەیلە لەخەڵکانی بوازیج بەناوی ساڵح کوڕی مەحمود ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و ڕێگەی دەشتی گرتەبەر. دەستەیەك لەهۆزی منالەکانی مالیك لەدەوری کۆبوونەوە. دواتر ڕێگەی سنجاری گرتەبەر و سامانی دانیشتوانی ئەو ناوچەی تالآن کرد. لەڕێگە ڕووبەڕووی چەندین کاروان بوویەوە و دەیەکی سامانەکانی لێ سەندن. لەسنجار وتاری خوێندەوە و دەبێت و نەبێتەکانی پەروەردگاری بیری خەڵکان هێنایەوە و لەمبارەوە ئاخاوت و زیادی کرد: شوێنکەوتەی دوو خەلیفەی یەکەمین و لەدوو خەلیفەی گلآوی دواتر خۆمان بەدوور دەگرین و مەسح بەسەر پێلاوەوە بەڕاست نازانین.

لەو سەرزەمینەوە بەرەو شەجاجیە لەموسڵ بەڕێکەوت و لەدانیشتوانی ئەو دەڤەرە داوای دەیەکی کرد. چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە و دواتر بەرەو حەدیسیە لەخوارەوەی موسڵ ڕۆشت و زەکاتی موسوڵمانەکانی داوا کرد و باجی لەمەسیحییەکان سەند. لەنێوان ئەوان جەنگ ڕوویدا و دەستەیەك لەهاوەڵانی ساڵح کوژران و خەڵکی ئەو سەرزەمینە ڕێگەیان نەدا ساڵح و سوپاکەی بڕۆنە ناو شارەکەیان و شەش عارەبانەی ئەوانیان سوتاند. دواتر ڕووی کردە بەشی ڕۆژئاوا. خەڵکی حەدیسیە، محەممەد کوڕی ساڵحیان گرت. نەسر کوڕی حەمدان کوڕی حەمدون ئەوی قۆڵبەست کرد و بردییە موسڵ. ساڵح هێرشی کردە سەر سن. خەڵکی سن لەبەرابەر پێدانی پارە خۆیان ڕزگار کرد و ئەو هێرشی کردەسەر بوازیج و لەوێوە بەرەو تەل خوسا کەگوندێك لەدەوروبەری موسڵ لەزێی سەرەوە بوو، ڕۆشت و سەبارەت بەکوڕەکەی نامەی بۆ خەڵکانی موسڵ نووسی و داوای ئازادی کوڕەکەی کرد و وتی ئەگەر ئازادی نەکەن، فلآنە و فیسارە کار دەکات. دواتر ڕێگەی سەلامییەی گرتەبەر و نەسر کوڕی حەمدان لەپێنجی شەعبان/ پێنجی سێپتامبەری ئەم ساڵە هێرشی کردەسەر. ساڵح لەسەلامییە بۆ بوازیج هەلآت و نەسر شوێنی کەوت ولەبوازیج پێی گەیشتەوە و شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان هەڵگیرسا. ژمارەیەك لەهاوەڵانی نەسر کوژران و ساڵح و دوو کوڕەکەی

ئەسیر کران. ئەوانیان بردە موسڵ و لەوێوە ڕەوانەی بەغدادیان کرد. هاوشێوەی کەسانی ڕیسوا ئەوانیان بردە بەغداد.

لەشەعبان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە لەموسڵ پیاوێکی خارجی بەناوی ئەغور کوڕی مەتەرەی سەعلەبی سەری بەرز کردەوە. دەوترا ئەو لەمناڵەکانی عیتاب کوڕی کولسومی سەعلەبی برای عەمرۆ کوڕی کولسومی شاعیرە. ئەو لەکەنارەکانی ڕەئس عەین ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و مەبەستی کەفەرتوسای کرد. دوو هەزار پیاو لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو ڕۆشتە کەفەرتوسا و لەوێ سەرقاڵی کوشت و کوشتار بوو.

دواتر ڕێگەی نەسیبینی گرتەبەر و لەنزیك ئەو شارە ئوردووی لێدا. فەرمانڕەوای ئەم شارە لەگەڵ دەستەیەك لەسەربازان و خەڵکان هێرشیان کردەسەر و ڕووبەڕووی بوونەوە. ئەغور سەد کەس لەوانی کوشت و هەزار کەسی ئەسیر کرد. هەموو ئەسیرەکانی فرۆشت و خەڵکی نەسیبین لەبەرابەر پێدانی چوارسەد هەزار دینار پەیمانیان لەگەڵ بەست.

ئەم هەواڵە بەناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان، فەرمانڕەوای دیاری ڕەبیعە گەیشت. ئەو سوپایەکی بۆ جەنگی ئەغور ڕەوانە کرد. سوپای ناسر ڕووبەڕووی ئەغور بوویەوە و سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا وئەسیری کرد. ناسر ئەلدەولە ئەوی بۆ بەغداد ڕەوانە کرد.

## ناسازگاری جەعفەر کوڕی باوکی جەعفەر و گەڕانەوەی ئەو

جەعفەر کوڕی باوکی جەعفەر کوڕی باوکی داود، دانیشتوی خوتەل و بەنوێنەرایەتی سامانییەکان کارگوزاری ئەو شارە بوو. چەندین کردەوەی لێ بینرا و گومانی شۆڕش و یاخیبوونی لێ دەکرا. نامەیان بۆ باوکی عەلی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موزەفەر نووسی تا مەبەستی جەنگی ئەو بکات. باوکی عەلی هێرشی کردەسەر و دوای جەنگ ئەوی گرت و ڕەوانەی بوخارای کرد. ئەمە پێش شۆڕشی باوکی زەکەریا یەحیا بوو. جەعفەر دوای گەیشتنی بۆ بوخارا زیندانی کرا. کاتێك باوکی زەکەریا ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر، ئەوی لەزیندان هێنایەدەر

و کردییە هاوڕێی خۆی. ئەو لەیەحیا داوای مۆڵەتی کرد تا بۆ خوتەل بگەڕێتەوە و هێزی بۆ کۆبکاتەوە. یەحیا مۆڵەتی پێدا بەڵام کاتێك جەعفەر گەیشتە خوتەل، ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد نیشاندا و بەم شێوەیە بەسەرهاتی ئەو کۆتایی هات. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٣١٨/٩٣٠ زایینی روویدا.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا سوارەکان شۆڕشیان کرد و خەلیفەیان لەسەرکێشی ئاگادار کردەوە. موقتەدر، سەرکردەی ئەوانی بانگ کرد و بەڵێنی چاکەی پێدان و پەیمانی بەست مانگی داهاتوو مانگانەی ئەوان بدات. سوارەکان ئارام بوونەوە بەڵام پیادەکان شۆڕشیان کرد و موقتەدر بەناچاری مانگانەی ئەوانیشیدا.

لەم ساڵەدا موقتەدر خەلاتی بەهارونی کوڕی بەخشی. هارون سوار بوو و وەزیر و سوپا هاوڕێیەتیان دەکرد. موقتەدر، سنورەکانی فارس، کرمان، سیستان و مەکرانی خستە ژێر فەرمانی ئەو.

لەم ساڵەدا موقتەدر، خەلاتی بەکوڕەکەی دیکەی، باوکی عەباس بەخشی و سەرزەمینەکانی رۆژئاوا، میسر و شامی خستە ژێر فەرمانی ئەو. ئەو، مونس موزەفەری وەك نوێنەری خۆی لەو سەرزەمینانە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا دوو کوڕەکەی رائیق لەفەرماندەیی پاسەوانەکان دوورخرانەوە و ئەبوبەکر محەممەد کوڕی یاقوت جێگەی ئەوانی گرتەوە.

لەم ساڵەدا لەنەسیبین لەنێوان دانیشتوانی باب(دەروازە) ئەلروم و بابی رۆژهەلات ئاژاوە روویدا و ئاگری شەڕێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند. خەڵکانێك لەعەرەبەکان و کەسانی دەوروبەر خۆیان خستە ناو ئەوان و ژمارەیەکیان کوژران. ماڵ و دووکانەکان سووتان و سامانەکان تالان کرا. هەروەها کاروانێکی گەورە کەبەرەو شام دەڕۆشت و لەو نزیکانە ئوردووی لێدا بوو، لەلایەن ئەوانەوە تالان کرا.

لەم ساڵەدا یەحیا کوڕی محەممەد کوڕی ساعدی بەغدادی لەتەمەنی نەوەد ساڵی مرد. ئەو لەزانایانی حەدیس بوو. قازی باوکی جەعفەر ئەحمەد کوڕی ئیسحاق کوڕی بەهلولی تەنوخی کەشارەزای ئەدەب و نەحو و شێعر بوو، مرد.

## ڕووداوەکانیساڵی سێسەد و نۆزدەی کۆچی ( ٩٣١ زایینی )

## لێڵ بوونی دووبارەی پەیوەندییەکانی نێوان موقتەدر و مونس

لەم ساڵەدا دووبارە پەیوەندییەکانی مونس و موقتەدر لێڵ بوو.

چۆنیەتییەکەی: محەممەد کوڕی یاقوت لەسلێمانی وەزیر خۆی دوور دەخستەوە و خوازیاری وەزارەتی حسەین کوڕی قاسم بوو. مونس لەبەر بوونی عەلی کوڕی عیسا و بڕوا کردن بەو، خوازیاری وەزارەتی سلێمان. پێگەی محەممەد کوڕی یاقوت بەرز بوویەوە و لەگەڵ ئەرکی فەرماندەیی پاسەوانەکان، کاروباری تایبەت بەسەرژمێری کردنی گرتە ئەستۆ و چەندین کەسی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و بە بوونی ئەوان هێزی خۆی زیاد کرد. مونس بەمە ڕازی نەدەبوو و داوای لەموقتەدر کرد، لێپرسراویەتی ئەو کارە لەمحەممەد وەربگرێتەوە. وتی: دەبێت ئەم کارە لەدەستی پێشەواکان و قازییەکان و پیاوە دادپەروەرەکاندا بێت و ڕەوا نییە بەکەسانی دیکە بسپێردرێت. موقتەدر بەداواکەی ڕازی نەبوو.

مونس هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و کاتێك ئەمەی کرد، یاقوت و کوڕەکەی پیاوەکانی خۆیان لەکۆشکی خەلافەت و ماڵی کوڕەکەی محەممەد کوڕی یاقوت کۆکردەوە. بەمونسیان وت: محەممەد کوڕی یاقوت دەیەوێت شەوانە هێرش بکاتە سەر ماڵەکەی تۆ. هاوەڵانی مونس هانیاندا تا ئەوەی بردیانە لای دەروازەی شەماسییە و خێوەتیان هەڵدا. لەم کاتەدا دووبارە مونس داوای لەموقتەدر کرد یاقوت کەپەردەداری خەلیفە بوو، لەو پێگەیە دوور بخاتەوە و فەرماندەیی پاسەوانەکان لەمناڵەکەی بستێنێتەوە و هەردووکیان لەکۆشك دەرپەڕێنێت. ئەم دوانە بۆ مەدائن دوورخرانەوە و موقتەدر، سنوری فارس و کرمانی بەیاقوت و سنوری ئیسفەهانی بەموزەفەر کوڕی یاقوت سپارد و سیستانی خستە ژێر فەرمانی ئەبوبەکر محەممەد کوڕی یاقوت و دوو مناڵەکەی ڕائیق، ئیبراهیم و محەممەدی لەجێگەی یاقوت و کوڕەکەی بۆ ئەرکەکانی ئەوان دیاریکرد و دوای

ماوەیەك یاقوتی وەك فەرمانڕەوای شیراز دیاریکرد. عەلی کوڕی خەلەف کوڕی تەیاب بەڵێنی کۆکردنەوەی باجی ئەو دیارەی دابوو. کاتێك یاقوت ڕۆشتە ئەو سەرەزەمینە، هەردووکیان بڕیاریاندا چیتر باج بۆ موقتەدر نەنێرن تا ئەو کاتەی لەساڵی ٩٣٤/٣٢٢ زایینی عەلی کوڕی بویەی دەیلەمی فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینی فارسی گرتەدەست.

## گرتنی سلێمانی وەزیر و وەزارەتی باوکی قاسمی کلوزانی

لەم ساڵەدا موقتەدر، وەزیرەکەی، سلێمان کوڕی حەسەنی گرت. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو سلێمان ڕووبەڕووی نەدارییەکی کوشندە بوویەوە و داواکارییەکان زیادی کرد و مانگانەی مووچەخۆرەکان نەدرا و نامەی ئەو کەسانەی خۆیان بۆ وەزارەت پالاوتبوو، بەردەوام بەدەستی موقتەدر دەگەیشت. ئەوان خراپەی سلێمانیان دەهێنایە سەرزمان و بەڵێنی دانی مووچەی سوپایی و خەڵکانیان دەدا. موقتەدر سلێمانی گرت و بردییە کۆشکەکەی خۆی.

موقتەدر خوازیار بوو حسەین کوڕی قاسم وەك وەزیر هەڵبژێرێت بەڵام مونس ڕێگەی ئەو کارەی لێدەگرت و بەردەوام پێشنیاری باوکی قاسمی کلوزانی بۆ ئەو پۆستە دەکرد. موقتەدر بەم کارە ناچار کرا و لەبیست و حەوتی ڕەجەب، حەڤدەی ئۆگۆست کلوزانی وەك وەزیر دەستنیشان کرد. وەزارەتی سلێمان یەك ساڵ و دوو مانگ درێژەی کێشا. وەزیرێکی ناتەوان و عەلی کوڕی عیسا سەرپەرەستی دیوانەکان و کارەکانی دیکەی دەکرد. ئەو بەتەنیا لێکۆڵینەوەی لەدادخوازییەکان دەکرد و کەسێکی دیکەی وەك سەرپەرەستی دیوانی عێراق دەستنیشان کردبوو. بەم شێوەیە شیرازەی دەوڵەت تێکچوو. سلێمان پێشوەخت کەسانێکی ڕاسپاردبوو تا خواردەمەنی ئەو کەسانەی جگە لەخزمەتی حکومەتی شارەزای هیچی دیکە نەبوون، بکڕن و بەهای ئەوانی بەنیوە دەدا. هەمان کاریشی لەگەڵ فەقیە و شارەزایانی دینی دەکرد.

ئەبوبەکر کوڕی قەرابە پەیوەندی لەگەڵ موفلیحی خزمەتکاردا بوو. موفلیح ئەوی بردە لای موقتەدر و پێی وت: ئەبوبەکر شارەزای کۆکردنەوەی باجە.

موقتەدر ئەوی بۆ ئەم کارە راسپارد بۆ ئەوەی بارودۆخ سامان بدات. ئەو هەوڵیدا بەزۆر پارە لەو کەسانەی دەبوا پارە بەگەنجینە بدەن، وەربگرێت و بەم شێوەیە جەستەی حکومەتی داڕزاند و دیوانەکانی ریسوا کرد و چیتر وەزیرەکان و پیاوانی حکومەت لێپرسینەوەیان لەکاروباری خەڵکان نەدەکرد و بۆ ئەوان خۆیان نەدەخستە رەنجەوە مەگەر لەبەر داهاتێکی چاوەڕوان کراو. ئەم دەستەیە لەدینێك کەئەوان بەلێپرسینەوە لەکاروباری خەڵکان ناچار بکات، بەدوور بوون. هەرکات خەڵکان دابین کەری داهاتی ئەوان نەدەبوون، دەستیان لەکارەکانیان هەڵدەگرت و نیازەکانی ئەوانیان بەدینەدەهێنا. من (نووسەر) خۆم لەم رۆژگارەدا بەئاشکرا بینیومە کەسوودی گشتی و تایبەتی بێ ژمار، بەهۆی ئەم کردارەوە، لەناو چووە و بەفیرۆ دراوە.

## جەنگی نێوان هارون و سوپاکەی مەرداویج

پێشتر وتمان ئەسفار کوژرا و مەرداویج هاتە سەرکار و دەستی بەسەر قوهستان، رەی و ناوچەکانی دیکە گرت. دەیلەمییەکان لەبەر بەخشندەیی و چاکەکاری ئەو لەگەڵ سوپاییەکان لەهەموو کەنارەکانەوە پەیوەستی بوون و بەم شێوەیە سوپاکەی بەهێز و ژمارەیان زیادی کرد و خەرجییەکان فراوان بوون. سامانەکەی ئەو بۆ ئەم خەرجییانە بەسەندەی نەدەکرد. بۆ ئەم مەبەستە نوێنەرەکانی خۆی بۆ سەرزەمینەکانی دەوروبەر نارد.

ئەو خوشکەزاکەی خۆی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ هەمەدان نارد. فەرمانڕەوای ئەو شارە باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی خەلەف و لەگەڵ سوپای خەلیفە لەو ناوچەیە بەسەری دەبرد. لەنێوان ئەم دووانە چەندین جەنگ روویدا. خەڵکانی هەمەدان هاوکاری سوپای خەلیفەیان دەکرد و دەرئەنجام بەسەر سوپای دەیلەمیدا سەرکەوتن و خوشکەزاکەی مەرداویج کوژرا. مەردوایج لەشاری رەی هێرشی کردە سەر هەمەدان و کاتێك سوپای خەلیفە لەهاتنی ئەو ئاگادار بوونەوە، لەشارەکە هەڵاتن. مەرداویج گەیشتە هەمەدان و لەباب ئەلئەسەد ئوردووی لێدا. خەڵکانی هەمەدان سەنگەریان گرت. ئەو رووبەروویان بوویەوە و شکستی پێهێنان

و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئەو شارە کوژران. مەرداویج سووتاندی، ئەسیری گرت و دواتر شمشێری لەسەر پاشماوەی دانیشتوان هەڵگرت.

موقتەدر، هارون کوڕی غەریب ئەلخاڵی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و جەنگێکی قورس دەستیپێکرد. دەرئەنجام، هارون و سوپاکەی خەلیفە شکستیان خوارد و مەرداویج دەستی بەسەر هەموو قوهستان و کەنارەکانی هەمەداندا گرت و یەکێك لەسەرکردە گەورەکانی خۆی بەناوی کوڕی عەلانی قەزوێنی بۆ دەینەوەر ڕەوانە کرد. کوڕی عەلان بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانەکەی کوشت. سوپاکەی گەیشتە کەنارەکانی حیلوان و لەوێش تالآنی زۆریان کۆکردەوە و خەڵکێکی زۆریان کوشت و ژن و منداڵەکانی وەك ئەسیر هەڵگرت و گەڕانەوە.

## شۆڕشی لەشکری

لەشکری دەیلەمی یەکێك لەهاوەڵانی ئەسفار و پەنای بۆ خەلیفە برد. کاتێك هارون کوڕی غەریب ئەلخال لەبەرابەر سوپاکەی مەرداویج هەڵات، ئەو لەگەڵ هارون بەرەو قەرمیسین ڕۆشت. هارون لەوێ مایەوە و داوای هاوکاری لەموقتەدر کرد تا دووبارە بۆ جەنگی مەرداویج بڕواتەوە. هارون، لەشکری بۆ نەهاوەند نارد تا سامانەکانی لەو دیارە بێنێت. کاتێك لەشکری گەیشتە نەهاوەند و دارایی دانیشتوانەکەی بینی، چاوی تەماحی تێبڕی و سێ هەزار درهەمی لێ سەندن. ئەو ئەم بڕە پارەی لەماوەی حەوتەیەك کۆکردەوە و دواتر سوپایەکی ڕازاندەوە و لەجومادی الاخرە/ جون لەگەڵ سوپاکەی، لەدەستی هارون بەرەو ئیسفەهان هەڵات.

لەو کاتەدا ئەحمەد کوڕی کەیغەلەغ فەرمانڕەوای ئیسفەهان بوو هەڵبەت پێش زاڵبوونی مەرداویج بەسەر ئەو سەرزەمینە. ئەحمەد بۆ جەنگی لەشکری هاتەدەر بەڵام ڕیسوایانە شکستی خوارد و لەشکری ئیسفەهانی گرتە ژێر دەست. سوپاکەی ڕۆشتنە ناو شارەکە و لەناو ماڵ و کاروان سەراکاندا نیشتەجێ بوون

بەڵام لەشکری لەگەڵ ئەوان نەڕۆشتە ناو شارەکە. ئەحمەد کەهەڵاتبوو لەگەڵ سی سوار لەیەکێك لەگوندەکانی ئیسفەهان پەنای گرت و لەشکری لەکەنارەکانی ئیسفەهان دەسووڕایەوە کە لەناکاو ئەحمەد و ئەو دەستەی بینی. لەوانی پرسی. پێیان وت: ئەوان بێ گومان هاوەڵانی ئەحمەد کوڕی کەیغەلەغن. لەشکری لەگەڵ ژمارەیەکی کەم هێرشی کردە سەریان. کاتێك لێیان نزیك کەوتەوە، هەردوولا یەکیان ناسییەوە و دەستیان بۆ شمشێر برد. ئەحمەد بەشمشێرەکەی گورزێکی ئەوتۆی لەلەشکریدا کەخودەکەی شکاند و لەمێشکی چەقی و جەستەی بێ گیانی کەوتە سەرزەوی. تەمەنی ئەحمەد لەم کاتەدا لەحەفتا ساڵ تێپەڕی دەکرد. کاتێك لەشکری کوژرا، هاوەڵانی هەڵاتن و خۆیان گەیاندە ئیسفەهان و سەربازەکانی دیکەیان ئاگادار کردەوە و کاڵا و چوارپێکانی خۆیان بەجێهێشت و هەڵاتن. ئەحمەد گەڕایەوە بۆ ئیسفەهان. ئەمە پێش هاتنی مەرداویج بۆ شارەکە بوو. ئەمە یەکێك لەسەرکەوتنە گەورەکانی ئەحمەد بوو بەڵام پاداشتەکەی لابردنی لەفەرمانڕەوایەتی ئەو شارە و هاتنە سەرکاری موزەفەر کوڕی یاقوت بوو.

## فەرمانڕەوایەتی مەرداویج لەئیسفەهان

دواتر مەرداویج دەستەیەکی دیکەی بۆ ئیسفەهان نارد و ئەوان دەستیان بەسەر ئیسفەهاندا گرت و کۆشکەکانی ئەحمەد کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی باوکی دوڵفی عێجلی و باخ و بێستانەکانیان بۆ مەرداویج رازاندەوە. مەرداویج لەگەڵ چل یا پەنجا هەزار کەس هات و سوپایەکی دیکەی بۆ ئەهواز ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە دەستی بەسەر ئەهواز و خوزستاندا گرت و سامانێکی زۆریان لەو سەرزەمینە کۆکردەوە. مەرداویج بەشێکی لەناو هاوەڵانیدا دابەش و بەشێکی زۆری پاشەکەوت کرد.

مەرداویج نوێنەرێکی بۆ لای موقتەدر ڕەوانە کرد و دانیماڵیات و باجی ئەم شارانەی گرتە ئەستۆ. موقتەدریش لەهەمەدان و ماە کوفە چاوپۆشی کرد. موقتەدر بەوتەکانی مەرداویج رازی و ئەوی بەدانی باجی ساڵانەی دووسەد هەزار دینار ناچار کرد.

## لابردنی کلوزانی و وەزارەتی حسەین کوڕی قاسم

لەم ساڵەدا باوکی قاسمی کلوزانی لەوەزارەت دوورخرایەوە و حسەین کوڕی قاسم کوڕی عوبەیدالله سلێمان کوڕی وەهب وەك وەزیر دەستنیشان کرا.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: لەبەغداد پیاوێك دەژیا بەناوی دانیاڵ. ئەو فریودەر، زیرەك و دەغەڵکار بوو. ئەو کاغەزەکانی کۆن دەکرد و بەشێوەیەکی کۆن هێما و نیشانەی لەسەر دادەنان و ناوی دەستەیەك لەدەوڵەمەندەکانی دەنووسی و بەم شێوەیە سامانێکی زۆری کۆکردەوە. یەکێك لەم کارە درۆینانەی ئەو (میم، میم، میم) بوو کەچەندین هێمای لەسەر دەبینرا. ئەو کتێبەکەی بردە لای موفلیح و وتی: ئەم سێ میمە نیشانەی ناوی تۆیە چوونکە تۆ (موفلیح مەولای موقتەدریت) و چەندین نیشانەی دیکەی هێنایە سەرزمان. موفلیح ئەوی بێ نیاز کرد. حسەین کوڕی قاسم چاوی بەدانیاڵی کەوت تا ئەویش لەناو کتێبە درۆینەکەی خۆی ناو ببات و نیشانەکانی پێ بڵێت و بڵێت کەئەو وەزیری هەژدەهەمین خەلیفەی عەباسی دەبێت و کاروبارەکان لەسەر دەستی ئەو سامان دەدرێن و ئەوە دوژمنان سەرکوت دەکات وجیهان لەرۆژگاری ئەو ئاوەدان دەبێتەوە. ئەو ئەمانەی لەناو کتێبێکدا نووسیبوو کەلەوەی روویدا بوو و روویدەدا، خەڵکانی ئاگادار دەکردەوە و هەمووی ئەمانەی بۆ دانیاڵی پێغەمبەر(د.خ) دەگەڕاندەوە. دانیاڵ ئەم کتێبەی کۆن کرد و بۆ موفلیحی خوێندەوە. موفلیح کاتێك کتێبەکەی بینی، بردییە لای موقتەدر. موقتەدر پێی وت: ئایا کەسێك بەم تایبەتمەندییانە دەناسی؟ موفلیح وەڵامی دایەوە: جگە لەحسەین کوڕی قاسم نە. موقتەدر وتی: راست دەکەیت. دڵی منیش وا دەڵێت. کەواتە ئەگەر پەیك نامەی ئەوی هێنا، بیشارەوە و کەسی لێ ئاگادار مەکەرەوە.

موفلیح ڕۆشتە لای دانیالی و لێی پرسی ئایا ئەو کەسەی تایبەتمەندییەکانی لەم کتێبەدا ئاماژەی پێدراوە، دەناسێت؟ دانیال وتی: کەس بەو تایبەتمەندییە ناناسم. موفلیح وتی: ئەم کتێبە لەکوێوە بەدەستی تۆ گەیشتووە؟. دانیاڵی وەڵامی دایەوە: لەباوکمەوە بۆم ماوەتەوە کەئەویش لەباوکی..... موفلیح کتێبەکەی بۆ

لای موقتەدر گەڕاندەوە و موقتەدر بەوتەکانی رازی بوو. دانیاڵی حسەین کوڕی قاسمی لەم بەسەرهاتە ئاگادار کردەوە. لەم کاتەدا حسەین کوڕی قاسم نامەیەکی بۆ موفلیح نووسی و ئەو نامەکەی تەسلیم بەموقتەدر کرد. موقتەدر، ڕێزی لەدانیاڵی گرت و فەرمانی بەموفلیحدا پێشنیاری وەزارەتی حسەین کوڕی قاسم بکات و ڕەزامەندی مونس بەدەست بێنێت. ئەمە یەکێك لەگرنگترین هۆکارەکان بۆ وەزارەتی حسەین بوو چوونکە زۆرکەس بەو کارە رازی نەبوون.

بەرێکەوت کلوزانی گرفتاری نەداری و پێویستی بەحەوتسەد هەزار دینار پەیا کرد. ئەو دەستنووسی سەرپەرەستی دیوانەکانی بۆ موقتەدر نارد و وتی هیچ ڕێگە چارەیەك نییە مەگەر ئەوەی سەروەری باوەڕداران خۆی ئەم بڕە دابین بکات. موقتەدر ئەمەی پەسەند نەدەکرد.

کاتێك ئەم هەواڵە بەحسەین کوڕی قاسم گەیشت، بەڵێنی دانی هەموو خەرجییەکانیدا و رایگەیاند جیاواز لەوە هەزار هەزار دینار بەگەنجینە دەدات. نامەی ئەویان نیشانی کلوازنیدا وئەو دەستی لەکار کێشایەوە و وەزارەتی تەسلیم بەحسەین کرد. حسەین روویکردە بولەیق و بەڵێنی پارەی بەویشدا تا دڵی مونسی بۆ بەدەست بێنێت. ئەویش ئەو کارەی کرد و کلوزانی لەمانگی ڕەمەزان/ سێتامبەر لەسەر کار لابرا و حسەین لەبیست و هەشتی ڕەمەزان/ پانزەی ئۆکتۆبەر وەزارەتی گرتەدەست. وەزارەتی کلوزانی دوو مانگ و سێ ڕۆژ درێژەی کێشا. مناڵەکانی بەردی و کوڕی فوراتە خۆیان لەحسەین نزیك کردەوە. حسەین مەرجی دانا بۆ ئەوەی عەلی کوڕی عیسا خۆی لەکارەکانی ئەو هەڵنەقورتێنێت. بەداواکەی رازی بوون و عەلی کوڕی عیسا بۆ سافییە دوورخرایەوە.

## دەست پێکردنەوەی ئاڵۆزی لە پەیوەندییەکانی موقتەدر و مونس

لەزیحەججە/دێسامبەری ئەم ساڵە ئاڵۆزی پەیوەندییەکانی نێوان مونس و موقتەدر دەستی پێکردەوە و سەرئەنجام بەکوژرانی موقتەدر کۆتایی هات.

پێشتر ئاماژەمان بەسەرەتای ئەم ئاڵۆزییە داوە. ئێستا ئەو کاتە مونس ئاگادار دەبێتەوە حسەین کوڕی قاسمی وەزیر و دەستەیەك لەسەرکردەکان دژی ئەو

یەکیان گرتووە. مونس ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و حسەین ئاگادار بوویەوە و زانی مونس دەخوازێت شەوانە هێرش بکاتە سەر ماڵەکەی بۆ ئەوەی بیگرێت. لەبەر ئەوە حسەین تەنیا بەرەبەیانان دەڕۆشتە ماڵەکەی خۆی و لەوێوە دەڕۆشتە کۆشکی خەلافەت. مونس داوای لەموقتەدر کرد حسەین لەسەر کار لاببات و دەست بەسەر سامانی ئەودا بگرێت. موقتەدر ڕازی بوو بەوەی لەسەر کار لایببات بەڵام ڕەزامەندی بۆ زەوت کردنی سامانی ئەو نیشان نەدا و داوای لەحسەین کرد لەماڵەکەی بمێنێتەوە. مونس بەمە ڕازی نەبوو. حسەین هێشتا وەك وەزیر هەڵس و کەوتی دەکرد. حسەین بەم هەواڵە کەمونس بیر لەرفاندنی باوکی عەباس یا هەمان ڕازی کوڕی موقتەدری لەسەردایە، لەنێوان ئەو دوانەدا دووبەرەکی دروست کرد. حسەین بەموقتەدری وتبوو مونس دەخوازێت باوکی عەباس بباتە شام و بەیعەتی بۆ وەربگرێت. موقتەدر، باوکی عەباسی کوڕی خۆی بۆ کۆشك بانگ کرد. ئەو لەرووداوەکە ئاگادار بوویەوە و کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، ئەو بەڵای بەسەر حسەین هێنا کەئاماژەی پێدەدرێت.

حسەین نامەیەکی بۆ هارون نووسی. هارون دوای شکست لەمەرداویج، ڕوویکردبووە دەیری عاقول. حسەین ئەوی بۆ بەغداد بانگ کردەوە و نامەیەکیشی بۆ محەممەد کوڕی یاقوت لەئەهواز نووسی و فەرمانی پێدا بەخێرایی ڕێگەی بەغداد بگرێتەبەر. سوور بوونی مونس بۆ جەنگ زیادی کرد چوونکە بێ گومان بوو لەوەی حسەین خوازیاری لەناو بردنی ئەوە. ئێمە هەموو کردەوەکانی ئەو لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٩٣٢/٣٢٠ زایینی باس دەکەین.

## جەنگی نێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان

لەرەبیع الاوەل/ مارسی ئەم ساڵە، سومەل، فەرمانڕەوای تەرسوس، مەبەستی سەرزەمینی ڕۆمی کرد و لەرووبار پەڕییەوە. لەم کاتەدا بەفر باری بەرادەیەك تا سینەی ئەسپەکان دەهات. ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکان هێرشیان کردنەسەر. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و خواوەند هاوکاری موسوڵمانانی کرد و توانیان شەششەد کەس لەرۆمییەکان بکوژن و سێ هەزار کەس دیل بکەن و زێر و زیوی

قراوان وەك تالآنی بەدەست بێنن.

لەرەجەب/ جولای ئەم ساڵە سومەل بۆ تەرسوس گەڕایەوە و لەگەڵ سوارەکان و پیادەکان، لەهاویندا رۆشتە سەرزەمینی رۆم و گەیشتنە عەموریە. ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکان لەو ناوچەیە مۆڵیان خواردبوو. کاتێك لەهاتنی سومەل ئاگادار بوونەوە، لەعەموریە هەلأتن. موسوڵمانان ڕۆشتە شوێنی ئەوان و کالا و خواردەمەنی زۆریان دەستکەوت و کۆیان کردەوە. ئەوەی رۆمییەکان ئاوەدانیان کردبوو، وێرانیان کرد. پێشڕەوی خۆیان لەناو شارەکانی رۆم درێژە پێدا و جگە لەتالآنی بیریان لەهیچی دیکە نەدەکردەوە. ژمارەیەکی زۆر بێ تاوانیان کوشت و زۆربەی ناوچەکانیان خاپور کرد تا گەیشتنە ئەنقەرە. ناوی ئەمرۆیی (رۆژگاری نوسەر) ئەنکوریەیە و بێ زیان گەڕانەوە. بەهای دیلەکان سەد و سی و شەش هەزار دینار بوو. ئەوان لەکۆتایی رەمەزان/ حەڤدەی ئۆکتۆبەر گەیشتنەوە تەرسوس.

لەم ساڵەدا کوڕی دەیرانی و ئەرمەنەکانی دیکەی کەنارەکانی ئەرمەنستان نامەیان بۆ رۆمییەکان نووسی و ئەوانیان بۆ هێرش کردنە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان هاندا و بەڵێنی هاوکارییان پێدان. رۆمییەکان لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوتن و بەزکەری و دیاری خەلأت و کەنارەکانیان وێران کرد و ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانەکانیان کوشت و ئەسیر کرد. ئەم هەواڵە بەموفلیح، کۆیلەی یوسف کوڕی باوکی ساج و فەرمانڕەوای ئازەربایەجان گەیشت و لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو ئەرمەنستان بەرێکەوت هێزە خۆبەخشەکان لەدوای ئەوان ملی رێگەیان گرتەبەر. ئەم سوپایە لەرەمەزان/ سێپتامبەر گەیشتە ئەرمەنستان و مەبەستی کوڕی دەیرانی و هاوپەیمانەکانی ئەوی کرد. کەسانی بنەماڵەی ئەویان کوشت و سامانەکانیان تالآن کرد. کوڕی دەیرانی لەشوێنی مانەوەی خۆی پەنای گرت. سوپاکەی موفلیح لەکوشتنی ئەرمەنییەکان زێدەڕۆییان کرد تا ئەو جێگەی دەوترێت ژمارەی کوژراوەکان گەیشتە سەد هەزار کەس و خواوەند زاناترە.

سوپای رۆم هێرشی کردە سەر سەمیسات و ناکاوگیری کردن. دانیشتوانەکەی داوای هاوکارییان لەسەعید کوڕی حەمدان کرد. موقتەدر بەو مەرجە فەرمانڕەوایەتی موسڵ و دیاری رەبیعەی پێ سپاردبوو کەرووبەرووی رۆمییەکان ببێتەوە و مەڵتیە لەدەستی ئەوان رزگار بکات. خەڵکانی مەڵتیە بەرادەیەك ناتەوان ببوون کەملکەچی

خۆیان بۆ فەرمانەکانی ڕۆمییان نیشاندابوو. ڕۆمییەکان لەم شارەدا فەرمانڕەوایەتی موسوڵمانانیان دەکرد. کاتێك نێردراوی دانیشتوانی سەمیسات گەیشتە سەعید، سوپای ڕازاندەوە و هێرشی کردە سەر ڕۆمییەکان. کاتێك گەیشتە ئەو دەڤەرە، ئەوەندەی نەمابوو ڕۆمییەکان دەست بەسەر شارەکەدا بگرن و کاتێك سەعید لێیان نزیك کەوتەوە، ڕۆمییەکان هەڵاتن. سەعید لەڕێگەی سەمیساتەوە بەرەو مەڵتیە بەڕێکەوت. لەم شارەدا دەستەیەك لەڕۆمییەکان لەگەڵ سوپاکەی مەلیحی ئەرمەنی و بەنی کوڕی قەیس، هاوڕێی موقتەدر، کەباوەڕی بەمەسیحی و پەیوەستی ڕۆمییەکان ببوو، کۆببوونەوە. ئەوان کاتێك لەهاتنی سەعید ئاگادار بوونەوە، شارەکەیان بەجێهێشت و چوونکە دەترسان لەوەی سەعید لەدەرەوە و دانیشتوانی شارەکە لەناوەوە هێرشیان بکەنەسەر، لەو سەرزەمینە دوور کەوتنەوە.

سەعید ڕۆشتە مەڵتیە و فەرمانڕەوایەکی بۆ دیاریکرد و گەڕایەوە. لەشەوال/ ئۆکتۆبەر بۆ جەنگ بەرەو ڕۆم بەڕێکەوت و دوو دەستەی وەك پێشەنگ ڕەوانە کرد. ئەم دوو دەستەیە پێش ڕۆشتنی سەعید بۆ ناو سەرزەمینی ڕۆمییەکان، ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەشەوال/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە لافاوێکی گەورە دەشتی تکریتی گرتەوە و چوارسەد ماڵ و دووکان نغرۆ بوون. قوڵایی ئاو لەناو بازارەکان گەیشتە چواردە وەجەب. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان خنکان و موسوڵمان و مەسیحی لای یەك بەخاك سپێردران بێ ئەوەی لەیەکتر جیا بکرێنەوە.

لەم ساڵەدا بایەکی سور لەموسڵ هەڵیکرد و دواتر بۆ ڕەشە با گۆڕا بەشێوەیەك مرۆڤ کەسی تەنیشتی خۆی نەدەبینی. خەڵکان گومانیان دەکرد ڕۆژی هەستانەوە دەستی پێکردووە. دواتر باران باری و تۆفان ئارامی گرت.

لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەبدوللە کوڕی ئەحمەد کوڕی مەحمودی بەڵخی لەمانگی شەعبان/ ئۆگۆست، مرد. ئەو یەکێك لەقسەکەرانی موعتەزیلە بوو.

## رووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیستی کۆچی (٩٣٢ زایینی)

## بەرێکەوتنی مونس بۆ موسڵ

لەموحەرەم/ ژانویەی ئەم ساڵە مونسی موزەفەر بۆ تۆڵەسەندنەوە لەموقتەدری خەلیفە رێگەی موسڵی گرتەبەر.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێك دڵنیا بوو لەوەی حسەین کوڕی قاسمی وەزیر، پەیکی بەشوێن هارون کوڕی غەریب و محەممەد کوڕی یاقوت ڕەوانە کردووە و ئەو دوانەی بانگ کردۆتەوە، ترسا. دواتر بیستی حسەین پیاوەکان و بەرد هاوێژەکانی لەکۆشك کۆکردۆتەوە و پەیمانیان بەستووە و هارون کوڕی غەریب لەبەغداد نزیك بۆتەوە. مونس توڕەیی خۆی دەربڕی و بەرەو موسڵ بەرێکەوت و کۆیلەکەی خۆی بوشرای لەگەڵ نامەیەك بۆ لای موقتەدر ڕەوانە کرد. حسەین داوای نامەکەی لەبوشرا کرد. بوشرا وتی: تەنیا نامەکە بەسەروەری باوەڕداران دەسپێرم. موقتەدر کەسی بۆ لای بوشرا نارد و داوای لێکرد نامە تەسلیم بەوەزیر بکات. بوشرا رازی نەبوو و وتی: گەورەم فەرمانێکی لەو شێوەی پێنەداوم. وەزیر جوێنی بەو و مونسدا و فەرمانی ئەشکەنجە کردنی بوشرای دەرکرد و ئەوی بەدانی سێسەد هەزار دینار ناچار کرد و ئەم بڕە پارەی لێسەند و دواتر زیندانی و ماڵەکەی تالاڵن کرد.

مونس کەچاوەڕوانی دڵنەوایی و گەڕاندنەوەی خۆی لەلایەن موقتەدرەوە بوو، کاتێك ئەمەی بینی، لەگەڵ سەرکردەکانی خۆی بەرەو موسڵ بەرێکەوت. حسەین فەرمانی بەهەموو سەرکردە و کۆیلەکانی خۆیدا بۆ بەغداد بگەڕێنەوە. دەستەیەك بۆ بەغداد گەڕانەوە. مونس لەگەڵ هاورێیان و موالییەکان و هەشسەد کەس لەخەڵکانی ساجییە بەرەو موسڵ بەرێکەوت. وەزیر فەرمانیدا دەست بەسەر زەوییەکانی مونس و هاورێکانی ئەو بگرن و لەم رێگەوە سامانێکی زۆری بەدەست هێنا و ئەمە پێگەی ئەوی لای موقتەدر بەرز کردەوە و وەزارەتەکەی بەهێز بوو. حسەین هەرکەسێکی دەویست، کاروباری پێ دەسپارد و هەرکەسی

دەویست، لایدەبرد. موقتەدر نازناوی عەمید ئەلدەولەی پێبەخشی و ناوی ئەوی لەسەر درهەم و دینارەکان هەڵکەند.

لەو کەسانەی وەزیر، هێنایە سەرکار، یەکیان باوکی یوسف یەعقوب کوڕی محەممەدی بورەیدی بوو کەفەرمانڕەوایەتی بەسرە و کەنارەکانی پێسپارد. باوکی یوسف بەڵێنی پێدانی پارەیدا کە بۆ خەرجییەکانی بەسرە و کەنارەکانی بەسەندە نەبوو چ بگات بەگەنجینە. بەڵێنی پێدانی سی هەزار دیناری بەوەزیردا. کاتێك فەزڵ کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی فورات لەبەڵێنەکەی باوکی یوسف ئاگادار بوویەوە، هەڵەی ئەوی بۆ ئەم بەڵێنە بیرخستەوە و ئاگاداری کردەوە ناتوانێت ئەو باجە کۆبکاتەوە. باوکی یوسف بەڵێنیدا خەرجییەکانی بەسرە دابین دەکات و ساڵانە هەشتا هەزار دینار بەگەنجینە بسپێرێت. ئەم هەواڵە بەموقتەدر گەیشت و باوکی یوسف لای موقتەدر پێگەی بەرز بوویەوە. وەزیر بەهۆی پەیمانی دووەم شوێن باوکی یوسف کەوت و باوکی یوسف خۆی حەشاردا و بەردەوام لای موقتەدر خراپەی حسەینی دەهێنایە سەرزمان تا ئەوەی بارودۆخی وەزیر پەرێشان بوو.

## لابردنی حسەین کوڕی قاسم لەوەزارەت

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی قاسم لەوەزارەت دوورخرایەوە چوونکە خراپەکارییەکانی زیادی کرد و خەرجییەکانی فراوان بوو. ئەم ساڵە، ساڵی گەڕاندنەوەی وام و قەرز زۆرەکان بوو کە ساڵەکانی پێشتر خەرجی کردبوو. هارون کوڕی غەریب، موقتەدری لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە و موقتەدر، خوسەیبی بۆ هاوکاری وەزیر هەڵبژارد. کاتێك خوسەیبی هاتەسەر کار و لێکۆڵینەوەی لەکارەکانی وەزیر کرد، بینی لەکاروباری ژمێریاری ڕێگەی دەغەڵکاری لەگەڵ موقتەدر گرتۆتەبەر. موقتەدر هەموو دەبیرەکانی کۆکردەوە تا راستییەکان ئاشکرا بکرێت. هەموو دەبیرەکان هاتنە بارەگای موقتەدر و قسەکانی خوسەیبیان پشت راست کردەوە و لەگەڵ وەزیر ڕووبەڕوو بوونەوە. حسەین کوڕی قاسمی وەزیر لەرەبیع الاخر/ ئاوریل قۆڵبەست کرا. وەزارەتی ئەو حەوت مانگ درێژەی کێشا.

لەم کاتەدا موقتەدر، باوکی فەتح فەزڵ کوڕی جەعفەری وەك وەزیر هەڵبژارد و حسەینی رادەستی ئەو کرد بەڵام ئەو بەشێوەیەکی خراپ لەگەڵ حسەین مامڵەی نەکرد.

## زاڵبوونی مونس لەموسڵ

پێشتر باسی رۆشتنی مونسمان بۆ موسڵ کرد. کاتێك حسەینی وەزیر لەرەوانە بوونی مونس ئاگادار بوویەوە، سەعید و داود، دوو کوڕەکەی حەمدان و برازای ئەو دوانە، ناسر ئەلدەولە حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدان، نامەی نووسی و فەرمانی پێدان لەگەڵ مونس بجەنگن و رێگە نەدەن بڕواتە ناو موسڵ.

مونس لەسەر رێگەکەی نامەی بۆ سەرکردە عەرەبەکان نووسی و داوای هاوکاری لێکردن. دیاری گرانبایی پێشکەش دەکرد و دەیوت: خەلیفە ئەوی وەك فەرمانڕەوای موسڵ و دیاری رەبیعە دیاریکردووە.

هەموو منداڵەکانی حەمدان بۆ جەنگی مونس کۆبوونەوە و تەنیا داود کوڕی حەمدان لەبەر چاکەخوازی بۆ مونس بەشداری جەنگی نەکرد چوونکە مونس دوای باوکی ئەوی لەداوێنی خۆی پەروەردە و چاکەی لەگەڵ کردبوو. کاتێك ئەو رازی نەبوو لەجەنگی دژی مونس بەشداری بکات، براکانی هەوڵیاندا رەزامەندی ئەو بۆ جەنگ بەدەست بێنن تا ئەوەی بۆ جەنگ ئامادەیی خۆی نیشاندا. ئەوان بیری داودیان خستەوە کەحسەین و باوکی هەیجا دوو کوڕەکەی حەمدان چەندین جار خراپەیان لەگەڵ موقتەدر کردووە و هەنووکە کاتی ئەوەیە ئەم پەڵە ڕەشە لەسەر بنەماڵەکەی بسڕنەوە. کاتێك داود رەزامەندی نیشاندا، پێی وتن: سوێند بەخوا ئێوە بەخراپەکاری و ناسپاسی ناچارم دەکەن و دڵنیام تیرێك لەقوڕگم دەچەقێت و کۆتایی بەژیانم دێنێت. کاتێك دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە، بەهەمان شێوەی داود پێشبینی کردبوو، تیرێك بەرقوڕگی کەوت و گیانی گرت. کاتێك بەمونسیان وت داود بۆ جەنگی تۆ خۆی ئامادە کردووە، باوەڕی نەکرد و وتی: چۆن دژی من دەجەنگێت لەکاتێکدا لەمنداڵییەوە پەروەردەم کردووە. کاتێك مونس لەموسڵ نزیك کەوتەوە،، هەشتسەد سواری لەگەڵدا بوو. منداڵەکانی حەمدان

سێ هەزار کەس بوون. کاتێك دوو سوپا رووبەرووی بوونەوە، منداڵەکانی حەمدان و سوپا گەورەکەیان هەڵاتن و جگە لەداود کەسیان نەکوژرا. نازناوی موجەفجەفیان پێدا بوو. یەکێك لەشاعیرەکان بۆ سەرکۆنە کردنی ئەمیر سەبارەت بەموجەفجیف ئەم هۆنراوەی هۆنیوەتەوە:

لو کنت فی الف کلهم بطل مثل المجفجف داود بن حمدان

و تحتك الريح تجری حيث تامرها و فی يمينك سيف غير خوان

لكنت اول فرار الی عدن اذا تحرك سيف من خراسان

واتاکەی: ئەگەر تۆ لەگەڵ هەزار جەنگاوەر هاوشێوەی موجەفجیف داود کوڕی حەمدان بیت و با بەفەرمانی تۆ لە هەر شوێنێك هەڵبکات و شمشێرێکی کاریگەرت لەدەستدا بێت، ئەوسا شمشێرێك لەخوارسانەوە بکەوێتە جموجۆڵ، یەکەم کەس دەبیت بۆ عەدەن هەڵدێیت.

داود یەکێك لەبوێرترینی خەڵکان بوو. مونس لەسێی سەفەر/ پانزەی فەوریە هاتە موسڵ و دەستی بەسەر دارایی و سەرزەمینی منداڵەکانی حەمداندا گرت. لەم کاتەدا ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکانی بەغداد، شام، میسر، لەپیشە جۆراوجۆرەکان لەبەر چاکەکاری ئەو پەیوەستی بوون و ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان گەڕایەوە و پەیوەستی مونس بوو. مونس نۆ مانگ لەموسڵ مایەوە و دواتر مەبەستی ئەوەی کرد بەرەو بەغداد بەڕێکەوێت.

## کوژرانی موقتەدر

ئەو سوپاییانەی لەموسڵ لای مونس کۆبیوونەوە، پێیان وت: ئێمە ببە لای خەلیفە، ئەگەر دادپەروەری کردە پیشە و مانگانەی ئێمەیدا، چ باشتر وەگەرنە رووبەرووی دەبینەوە. مونس لەشەوال/ ئۆکتۆبەر لەموسڵەوە بەڕێکەوت و هەواڵی هاتنی ئەو بەسوپاکەی بەغداد گەیشت. دەنگە دەنگ کەوتە ناو ئەوان و هەموویان داوای مانگانەی خۆیان کرد. موقتەدر سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا بلاّو کردەوە بەلاّم بەشی هەموویانی نەکرد. موقتەدر، باوکی عەلا سەعید کوڕی حەمدان و ساقی بەسرەی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو سامەرا ڕەوانە کرد و ئەبوبەکر محەممەد

کوڕی یاقوتی لەگەڵ دوو هەزار سەرباز لەگەڵ کۆیلەکان و بەرد هاوێژەکان بۆ کەنارەکانی مەعشوق نارد.

کاتێك مونس گەیشتە تکریت، پێشەنگەکانی سوپاکەی ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە کاتێك لەمەعشوق نزیك کەوتەوە، سەربازەکانی کوڕی یاقوت یەك یەك و بەشێوەیەکی نهێنی بەرەو بەغداد هەڵدەهاتن. کاتێك کوڕی یاقوت ئەمەی بینی، بۆ عوکبرا پاشەکشێی کرد. مونس پێشڕەوی کرد و کوڕی یاقوت و سوپاکەی بۆ بەغداد گەڕانەوە. مونس لەباب ئەلشەماسییە ئوردووی لێدا و کوڕی یاقوت و هێزەکانی دیکە لەبەرابەر ئەو سەنگەریان گرت. موقتەدر هەوڵیدا کوڕە خاڵەکەی، هارون کوڕی غەریب بۆ هێرش کردن ناچار بکات بەڵام ئەو رازی نەبوو و وتی: من لەسوپاکەی خۆم دەترسم چوونکە بەشێکیان خوازیاری پەیوەست بوون بەسوپاکەی مونسن و بەشێکیان دوێنێ لەمەرداویج شکستیان خواردووە، دەترسم من تەسلیم بەو بکەن و خۆیان ڕێگەی هەڵاتن بگرنەبەر. موقتەدر وەزیری بۆ لای ئەو نارد. وەزیر پێداگری کرد و هارونی بۆ هێرش کردن ناچار کرد. کەسانی دەوروبەری موقتەدر پێشنیاریان کرد بڕێکی زۆر لەسامانی خۆی و دایکی خەرج بکات بۆ ئەوەی ڕەزامەندی سوپا بەدەست بێنێت و هەروەها کاتێك سوپاکەی مونس لەبەخشینی ئەم سامانە ئاگادار ببنەوە، لەدەوری ئەو بلاوەی لێ بکەن و مونس بەناچاری پاشەکشێ بکات و هەڵبێت. موقتەدر وتی: هیچ سامانێك بۆخۆم و دایکم نەماوەتەوە.

موقتەدر ویستی بڕواتە واست و لەوێ نامە بۆ سوپا بەربلاوەکانی بەسرە، ئەهواز، فارس، کرمان و ناوچەکانی دیکە بنێرێت و بەغداد بەمونس بسپێرێت تا ئەو کاتەی سوپایەکی ئامادە و پێویست کۆدەکاتەوە وبۆ جەنگی ئەو دەگەڕێتەوە. کوڕی یاقوت لەم بیرۆکەیە پەشیمانی کردەوە و بۆ جەنگی مونس هانیدا و ورەی پێبەخشی بەوەی هەرکات سوپا بیبینێت، هەموویان بۆ لای ئەو(خەلیفە) دەگەڕێنەوە. موقتەدر بەناڕەزامەندییەوە رازی بوو.

موقتەدر مۆڵەتی جەنگیدا و بەبێزارییەوە بەرێکەوت. فەقیە و قارییەکانی قورئانی، قورئان بەدەست کردە هاورێی خۆی و عاباکەی پێغەمبەری کردەبەر.

خەڵکانیش دەوریان گرتبوو. ئەو لەسەر تەپۆڵکەیەك و دوور لەگۆڕەپانی جەنگ وەستا. بەهەمان شێوە کەوەستا بوو، مۆڵەتی بەسەرکردەکان دەدا کەیەك لەدوای یەك بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی جەنگ دەهاتنە لای و ئەوانی بۆ گۆڕەپان دەنارد. کاتێك پێداگرییان کرد، لەشوێنەکەی خۆی زیاتر ڕۆشتە پێش بەڵام هاورێکانی پێش ئەوەی خەلیفە بگاتە لایان، هەڵاتن. موقتەدر فەرمانیدا جاڕ بدەن: هەرکەس ئەسیرێك بێنێت، دەدینار پاداشت وەردەگرێت و هەر کەس سەرێکی بڕاو بێنێت، پێنج دینار. کاتێك سوپاکەی موقتەدر هەڵاتن، عەلی کوڕی بولەیق لەهاوەڵانی مونس موقتەدری بینی و لەئەسپەکەی خۆی دابەزی، زەوی ماچ کرد و وتی: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ بگەڕێرەوە، نفرینی خواوەند لەو کەسەی تۆی هێنایە گۆڕەپانی جەنگ. ئەو مەبەستی گەڕانەوەی کرد کەدەستەیەك لەبەربەرییەکان و مەغریبییەکان بینیان. عەلی خەلیفەی بەوان سپارد و خۆی گەڕایەوە. ئەوان لەبەرابەر خەلیفە دەستیان بۆ شمشێر برد. موقتەدر وتی: هاوار لەئێوە، من خەلیفەم. وتیان: ئەی پەست! تۆمان بەباشی ناسی، تۆ خەلیفەی ئیبلیسی، بۆ هەر سەرێك پێنج دینار و بۆ هەر ئەسیرێك دەدینار پاداشت دەدەیت! یەکێك لەوان شمشێری لەشانیدا و موقتەدر لەئەسپەکەی کەوتە خوار و یەکی دیکە سەری بڕی. دەڵێن: عەلی کوڕی بولەیق ئیشارەی بۆ یەکێك لەوان کرد و فەرمانی پێدا سەری ببڕێت.

موقتەدر جەستەیەکی گەورە و ئەستوری بوو. کاتێك ئەویان کوشت، سەریان بڕی و بەدارێکەوە هەڵیانواسی. بەردەوام تەکبیریان دەهێنایە سەرزمان و نفرینیان دەکرد. جل و بەرگەکانی ئەو تەنانەت جلەکانی ژێرەوەیان فڕاند و جەنازەی ئەویان بەرووت و قووتی لەسوچێکدا فڕێدا تا ئەوەی پیاوێکی وەرزێر لای جەنازەکەی گوزەری کرد و بەگژ و گیا دایپۆشی و دواتر هەمان شوێنی هەڵکەند و خەلیفە موقتەدری بەخاك سپارد.

مونس لەراشدییە مابوویەوە و نەهاتبووە گۆڕەپانی جەنگ. کاتێك سەری موقتەدریان بردە لای، گریا و بەشەقەزللە کەوتە روخساری خۆی و وتی: ئەی خراپەکاران! ئایا فەرمانی کوشتنی ئەوم پێدابوون! دواتر وتی: ئەوتان کوشت و ئەمە سەرئەنجامی ئەو بوو. سوێند بەخوا هەموومان دەکوژرێن. کەمترین شتێك

کەگوناحەکەی ئێوە کەم دەکاتەوە ئەوەیە بڵێن بەهەڵە و نەزانراو کوشتووتانە.

مونس بەرەو شەماسییە بەرێکەوت و کەسی بۆ کۆشکی خەلیفە نارد تا رێگە نەدات کۆشك تالأن بکرێت. عەبدولواحید کوڕی موقتەدر، هارون کوڕی غەریب، محەممەد کوڕی یاقوت و دوو کوڕەکەی رائیق بۆ مەدائین هەڵاتن. ئەم کارەی مونس بووە هۆی ئەوەی فەرمانڕەوای کەنارەکان بوێری پێویست بۆ یاخیبوون دژی خەلیفە پەیا بکەن و چاوی تەماحیان بڕییە ئەو شتانەی پێشتر بیریان لێ نەدەکردەوە و چیتر خەلیفە وەك کەسێکی مەزن و شکۆدار سەیر نەدەکرا. خەلافەت بەرادەیەك لاواز بوو کەچەندایەتی و چۆنایەتییەکەی ئاماژەی پێدەدرێت.

لەوێوە کەموقتەدر کاروباری خەلافەتی زۆر پشتگوێ دەخست و ژنان و کۆیلەکان خۆیان لەکاروباری خەلافەت هەڵدەقوڕتاند و لەخەرجییەکان زێدەڕۆییان دەکرد، وەزیرەکانی لادەبرد یا وەزیری تازەی دەهێنایە سەرزمان، کارگوزار و فەرمانڕەواکان تەماحکار دەبوون و سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان دەکرد.

یەکێك لەخەرجییە بێهۆ و فیڕۆکانی ئەو بەفیڕۆدانی زیاتر لەحەفتا هەزار هەزار دینار بوو کە لەریزی خەرجییە ئاساییەکان هەژمار ناکرێت و ئەگەر رۆژگاری خەلافەتی ئەو لەگەڵ خەلافەتی موکتەفی برای و باوکی، موعتەزید، هەڵبسەنگێنین، ناسازگاری زۆر بەرچاو دەکەوێت. خەلافەتی موقتەدر بیست و چوار ساڵ و یانزە مانگ و شانزە رۆژ درێژەی کێشا و لەسی و هەشتەمین زستانی ساڵی لەدایك بوونی، کوژرا.

## خەلافەتی قاهیر باللە

کوژرانی موقتەدر بۆ مونس دژوار بوو، وتی: باشترین ئەندێشە ئەوەیە منالەکەی، باوکی عەباس ئەحمەد وەك خەلیفە هەڵبژێرین چوونکە میوەیەکە و خۆم پەروەردەم کردووە، منالێکی بیرمەندە و زانایی لەدین و بەخششدا هەیە و پابەندی بەڵێنەکانیەتی و هەرکات لەسەر تەختی خەلافەت دانیشێت، دایەگەورێی ئەو، دایکی موقتەدر، براکان و کۆیلەکانی ئەو، سامانی خۆیان دەخەنە بەردەستی و چیتر بۆ کوژرانی موقتەدر، تەنانەت دوو بزن شاخە لەیەك گیر ناکەن. باوکی یەعقوب ئیسحاق کوڕی ئیسماعیلی نەوبەختی رەخنەی لەمونس گرت و وتی: دوای ئەم هەموو بەلاّ و پەرێشانییە لەدەست خەلیفەیەك رزگارمان بوو کەکاروبارەکان لەلایەن دایك و کۆیلەکانی جێبەجیٚ دەکرا، هەنووکە دەخوازیت بۆ ئەو بارودۆخە بگەڕێینەوە. سوێند بەخوا رازی نابین مەگەر ئەوەی کەسێك شارەزا بێتەسەرکار و بتوانێت خۆی کاروبارەکان راپەڕێنێت. بەرادەیەك لەسەر ئەم داوایە پێداگری کرد کەمونس لەبیرۆکەکەی پەشیمان بوویەوە. لەم ناوەدا باسی باوکی مەنسور محەممەد کوڕی موعتەزدیان کرد و مونس رازی بوو. نەوبەختی بەچنگۆڵەکانی خۆی زەوی بۆ مەرگ دەکێلاّ چوونکە (قاهیر ئەو کەسەی بۆ خەلافەت پێشنیاری کرد) ئەوی کوشت و ئەمە ئاماژەی پێدەدرێت. ( ئەگەری هەیە شتێکتان خۆش بوێت و دەرئەنجامێکی خراپی بۆ ئێوە هەبێت.)[١٩]

مونس فەرمانیدا محەممەد کوڕی موعتەزید بێنن و لەبیست و هەشتی شەوال/ چواری نۆڤەمبەر وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ کرد و نازناوی قاهیر باللە یان پێبەخشی. مونس بەخەلافەتی ئەو و بەیعەت کردن لەگەڵ ئەو رازی نەبوو و دەیوت: من لەخراپەکاری ئەو ئاگادارم بەلاّم هیچ چارەیەکی دیکەم نییە.

کاتێك بەیعەتیان لەگەڵ قاهیر کرد، مونس، خەلیفەی سەبارەت بەخۆی و پەردەدارەکەی، بولەیق و عەلی کوڕی بولەیق سوێند دا و ئەمان نامەیان لەخەلیفە وەرگرت. کاروباری خەلافەت سەقامگیر و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ قاهیر کرد و

---

[١٩]- بقرة/٢١٦: و عسی ان تحبوا شیئا و هو شر لکم.

ئەو باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەك وەزیر دەستنیشان کرد کە لەفارس بوو. قاهیر، عەلی کوڕی بولەیقی وەك پەردەدار و دەرگاوانی خۆی هەڵبژارد و داوتر دەستی بەلێکۆڵینەوە لە منالْ و کەسەکانی موقتەدر کرد و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دایکی موقتەدر دەست پێکرد کەگرفتاری نەخۆشی وشك بوون (جۆرە نەخۆشییەکە کەمرۆڤ لەتینویەتی رزگاری نابێت) بوو. نەخۆشییەکەی پەرەی سەند و کاتێك بیستی کوڕەکەیان بەرووت و قووتی فڕێداوە، گریان و شین و ڕۆڕۆی دەست پێکرد و دەستی لەخواردن و خواردنەوە هەڵگرت تا ئەو جێگەی لەمردن نزیك بوویەوە. ژنەکان لەدەوری کۆبوونەوە و ئامۆژگارییەکان کرد تا ئەوەی سەرئەنجام رەزامەندی نیشاندا بۆ ئەوەی کەمێك نان و خوێ بخوات.

قاهیر ئەوی بانگ کرد و سەبارەت بەسامانەکەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد. دایکی موقتەدر باسی کەمێك جل و بەرگ و هۆکاری خۆ رازاندنەوەی کرد بەلاّم ناوی زێر و خشڵی نەبرد. قاهیر فەرمانی ئەشکەنجە کردنیدا و لەسەر یەك قاچ هەڵیواسی و ئازاری پێگەیاند. ئەو سوێندی خوارد جگە لەوەی ئاماژەی پێداوە هیچی دیکەی نییە. وتی: ئەگەر سامانم دەبوو رێگەم نەدەدا خوێنی کوڕەکەم بڕێژن و بەم شێوەیە هیچ شتێکی نەدەرکاند.

قاهیر دەستی بەسەر سامانی هەموو کەسەکانی موقتەدردا گرت و دایکی موقتەدری هێنا تا لەبەرابەر قازی و داوەرەکان شایەتی بدات بۆ ئەوەی خاوەندارییەتی خۆی لەسەر هەموو زەوییەکان هەڵبوەشێنێتەوە و مۆڵەتی فرۆشتن بەقاهیر بدات بەلاّم دایکی موقتەدر ئەو کارەی نەکرد و وتی: من ئەوانەم بۆ کاری خێر و کڕینی موشك بۆ دانیشتوانی مەککە و مەدینە و سنورەکان و ناتەوانەکان و هەژارەکان تەرخان کردووە، نەهەڵوەشاندنەوەی ئەوان بەڕەوا دەزانم و نەقاهیر دەتوانێت زەوییەکانی من بفرۆشێت. کاتێك قاهیر ئاگادار بوویەوە، قازی و داوەرەکانی بانگ کرد و ئەوانی کردە شایەتی خۆی کەخاوەنداریەتی دایکی موقتەدری لەسەر هەموو زەوییەکان هەڵگرتووە و دەتوانێت بیانفرۆشێت. قاهیر ئەو کارەی کرد و سوپاییەکان لەبری مانگانەی خۆیان هەڵیانگرت. قاهیر فەرمانیدا هێرش بکەنەسەر ماڵێك کەمناڵەکانی موقتەدر خۆیان تیا حەشاردابوو. ئەوان لەم

ماڵەدا، باوکی عەباس رازی، هارون، عەلی، عەباس، ئیبراهیم و فەزڵیان گرت و ڕەوانەی کۆشکی خەلیفەیان کردن و سامانێکی زۆری ئەوان دەستی بەسەردا گیرا. عەلی کوڕی بولەیق ئەوانی بەدەبیرەکەی خۆی حەسەن کوڕی هارون سپارد و حەسن چاکەکارانە هەڵس و کەوتی لەگەڵ کردن.

باوکی عەلی موقلە، لەسەر تەختی وەزارەت مایەوە و هەرکەسی دەویست، لەسەر کار لایدەبرد و دەستەیەکی دیکەی دەهێنایە سەرکار. ئەو دەستەیەك لەکارگوزارەکانی گرت. منالەکانی بورەیدی لەناویاندا دەبینران. هەمووی ئەوانی لەسەر کار لابرد ودەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرت.

## پەیوەست بوونی وەشمگیر بەمەرداویج برای

لەم ساڵەدا مەرداویج کەسی بەدوای وەشمگیری برای لەگیلان نارد و ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کرد. نێردەکەی ئەو بەکوڕی جوعد ناوی دەبرا. ئەو دەڵێت: مەرداویج منی نارد و فەرمانی پێدام بەرێز و خۆشەویستی براکەی بیەمە لای. کاتێك گەیشتمە گیلان، بەدوایدا گەڕام. منیان بۆ لای ئەو برد. ئەو لەگەڵ دەستەیەك سەرقاڵی چاندنی برنج بوو. کاتێك منیان بینی، پێپەتی و بەپانتۆڵی پینەکراو، لەدەوری من کۆبوونەوە. سلاّم بۆ وەشمگیر نارد و نامەی براکەیم پێدا و ئەوم لەفەرمانڕەوایەتی براکەی ئاگادار کردەوە. لەم کاتەدا بەدەمی خۆی جرتێکی بۆ براکەی لێدا و وتی: ئەو جل و بەرگی ڕەشی لەبەر کردووە و خزمەتی ڕەش پۆشەکان دەکات. مەبەستی لەم وتەیە خەلیفەی منالەکانی عەباسە.

هیوادارم کرد و تەماحم خستە بەردەم تا ئەوەی لەگەڵ من هات. کاتێك گەیشتمە قەزوێن، هەوڵمدا جل و بەرگی ڕەشی لەبەر بکەم. سەرەتا رازی نەبوو بەلاّم سەرئەنجام ڕەشی پۆشی. کوڕی جوعد دەڵێت: زۆر کار و کردەوەی نەزانانەم لێ بینی کە لەگێڕانەوەی ئەوان شەرم دەکەم بەلاّم دواتر بەخت ڕووی تێکرد و بۆ بەرێوە بردنی وڵات و هەڵسوڕاندنی کاروباری خەڵکان بوو بەیەکێك لەبەناوبانگترینی شاکان.

## بیر کردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا قازی باوکی عومەر محەممەد کوڕی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسماعیل کوڕی حیماد کوڕی زەید کەپیاوێکی بیرمەند و زانەر بوو، مرد. باوکی عەلی حسەین کوڕی ساڵح کوڕی خەیزوران، فەقیهی شافعی کەخۆپارێزێکی داوێن پاك بوو و بەردەوام پێشنیاری وەرگرتنی کاری داوەریان پێدەکرد بەڵام ڕازی نەدەبوو، کۆچی دوای کرد.

لەم ساڵەدا باوکی نوعەیم عەبدولمەلیك کوڕی محەممەد کوڕی عودەی، فەقیهی شافعی جورجانی (گورگانی) ناسراو بەئەستەرئابادی مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و یەکی کۆچی (٩٣٣ زایینی)

## بەسەرهاتی عەبدولواحید کوڕی موقتەدر و هاوەڵانی ئەو

پێشتر ئاماژەمان پێدا عەبدولواحید کوڕی موقتەدر، هارون کوڕی غەریب، موفلیح، محەممەد کوڕی یاقوت و دوو کوڕەکەی ڕائیق دوای کوژرانی موقتەدر، بۆ مەدائین هەڵاتن. دواتر ڕێگەی واسیتیان گرتەبەر و لەوێ مانەوە و (کاتێك بەهێز بوون) خەڵکان لێیان دەترسان. سەرەتا هارون کوڕی غەریب نامەیەکی بۆ بەغداد نووسی و داوای ئەمانی کرد. بەڵێنیدا ئەگەر زەوییەکانی بۆ بگەڕێتەوە و لەو زەوییانەی بەکرێی گرتووە، چاو بپۆشن، سێسەد هەزار دینار بەگەنجینە دەدات. هەروەها ماڵیاتە نەدراوەکانی زەوییەکەی بۆ گەنجینە دەگێڕێتەوە. قاهیر و مونس بەپێشنیارەکەی ڕازی بوون و ئەمان نامەیان بۆ نارد و کەنارەکانی کوفە، سەبزان و مێهرجان قەزەقیان خستە ژێر فەرمانی ئەو. هارون بەرەو بەغداد بەرێکەوت.

عەبدولواحید کوڕی موقتەدر، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەواست هاتەدەر و ڕووی کردە شوش و بازاری ئەهواز و ماڵیاتەکانی کۆکردەوە و کارگوزارەکانی دەرپەڕاند و لەئەهواز نیشتەجێ بوو. مونس سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و فەرماندەیی ئەم سوپایەی بەبولەیق سپارد.

ئەو کەسەی ئەوانی بۆ ڕەوانە کردنی سوپا هاندا، باوکی عەبدوڵڵەی بورەیدی بوو. ئەو کە لەزیندان هاتبووەدەر، ئەوانی لەدەرئەنجامی پشتگوێ خستنی عەبدولواحید ترساند. بورەیدی بەخێرایی پەنجا هەزار دیناری بۆ کۆکردنەوەی سوپا تەرخان کرد و لەبەرابەردا داوای فەرمانڕەوایەتی ئەهوازی کرد و بەڵێنیدا ئەو کاتەی لەئەهواز جێگر ببێت، پاشماوەی خەرجییەکان دەدات. مونس فەرمانی ئامادەباشی دەرکرد، سامانەکەی تەرخان و سوپا لەگەڵ باوکی عەبدوڵڵە بەرێکەوت.

محەممەد کوڕی یاقوت لەتەرخان کردنی دارایی و دەبێت و نەبێتەکان گرنگی بەبۆچوونی کەس نەدەدا و لەبەر ئەمە شکۆ و ڕێزی خۆی لای سەرکردە و

سەربازەکان لەدەستدا. کاتێك سوپاکەی مونس لەواست نزیك بوویەوە، سەرکردەکانی محەممەد کوڕی یاقوت نهێنییەکانی دڵی خۆیان ئاشکرا کرد و ئەویان پشتگوێ خست. کاتێك بولەیق گەیشتە شوش، عەبدولواحید و محەممەد کوڕی یاقوت ئەهوازیان بەجێهێشت و ڕێگەی شوشتەریان گرتەبەر. قەراریتی کە لەناو سوپاکەی محەممەد کوڕی یاقوتدا بوو، بەڵایەکی بەسەر دانیشتوانی ئەهواز هێنا پێشتر کەس ئەو کارەی نەکردبوو، سامانەکانی تاڵان و ئەوەی توانی، دەستی بەسەردا گرت و هیچ دانیشتوویەکی ئەهوازی لەخراپەکاری و ستەمکاری ئەو پارێزراو نەبوو.

عەبدولواحید و کوڕی یاقوت لەشوشتەر ئوردوویان لێدا و سەرکردەکان و سەربازەکانی ئەم دوانە داوای ئەمانیان لەبولەیق کرد و پەیوەستی سوپاکەی بوون. موفلیح و مەسروری خزمەتکار لەگەڵ عەبدولواحید مانەوە. ئەم دوانە بەمحەممەد کوڕی یاقوتیان وت: تۆ بەهۆی سامان و پیاوەکانت لەم شارەدا پارێزراویت بەڵام ئێمە نەسامانمان هەیە نەسەرباز و هاوڕێیەتی تۆ زیانی ئێمەی تیایە نەك سوود. ئێمە بڕیارمانداوە بۆ خۆمان و عەبدولواحید کوڕی موقتەدر ئەمان وەربگرین. محەممەد کوڕی یاقوت مۆڵەتی پێدان. ئەو دوانە نامەیان بۆ بولەیق نووسی و بولەیق، ئەمانی پێبەخشین. ئەوان پەیوەستی بولەیق بوون و محەممەد کوڕی یاقوت تەنیا مایەوە و خۆی دۆڕاند و جڵەوی کاروبارەکانی لەدەستدا. لەگەڵ بولەیق نامەیان گۆڕییەوە و پەیمانیان بەست ئەو بڕواتە لای بولەیق لەسەر ئەو بنەمایەی مونس و قاهیری خەلیفە ئەمانی پێبدەن و بولەیق دەبێت بەڵێنی وەرگرتنی ئەو ئەمانەی پێبدات. بولەیق ڕازی و سوێندی خوارد. محەممەد کوڕی یاقوت لەگەڵ ئەو ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی فەرمانڕەوایەتی هەموو ئەو سەرزەمینەی گرتەدەست و ستەمکاری کردە پیشە و دەستی بەسەر سامانی بازرگانەکاندا گرت و بەشێوەیەك لەگەڵ دانیشتوانەکەی جووڵایەوە، فەرەنگەکانیش ئەو کارەیان نەدەکرد. کەس ڕێگەی لێنەدەگرت تەنانەت دینی نەبوو ڕێگەی ئەم کارانەی لێ بگرێت. براکانی ئەو بۆ سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆیان گەڕانەوە. کاتێك عەبدولواحید و محەممەد کوڕی

یاقوت گەیشتنە بەغداد، قاهیر ڕێزی لەپەیمانەکەی محەممەد کوڕی یاقوت گرت و زەوییەکانی عەبدولواحیدی بۆ گەڕاندەوە و چاوپۆشی لەزەوت کردنی سامانی دایکی و زیان گەیاندن بەو کرد.

## ئالۆز بوونی پەیوەندی مونس و هاوڕێکانی لەگەڵ قاهیر

لەم ساڵەدا مونسی موزەفەر و بولەیقی پەردەدار و مناڵەکەی عەلی و باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەزیر لەقاهیر دوور کەوتنەوە و بارودۆخیان لەخەلیفە و کەسانی دەوروبەری دژوار کرد.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك محەممەد کوڕی یاقوت پێگەی لای قاهیر بەرز بوویەوە و قاهیر بەنهێنی راوێژی لەگەڵ دەکرد، عەلی کوڕی موقلە لەبەر ئەوەی دوژمنی محەممەد کوڕی یاقوت بوو، دڵتەنگ و بەمونسی وت کەمحەممەد لای قاهیر خراپەی ئەو دەهێنێتە سەرزمان و عیسای پزیشك لەنێوان ئەو دوانە (قاهیر و محەممەد کوڕی یاقوت) هەواڵ و زانیارییەکان ئاڵ و گۆڕ دەکات. موسا، عەلی کوڕی بولەیقی بۆ هێنانی عیسای پزیشك نارد. عەلی عیسای لای قاهیر بینی و لەهەمان شوێن گرتی و ئەوی بردە لای مونس. مونس بێ وەستان ئەوی ڕەوانەی موسڵ کرد. هەموان بۆ لەناوبردنی محەممەد کوڕی یاقوت یەکیانگرت. ئەو لەناو خێوەتەکەی لەئوردووگاکەی بوو کەعەلی کوڕی بول ، و هاوەڵانی هێرشیان کردەسەر بۆ ئەوەی بیکوژن. بەڵام ئەو خۆی شاردبوویەوە. هاوەڵانی عەلی سامانی محەممەد کوڕی یاقوتیان تالآن کرد لەو ڕۆژەی ئەو خۆی شاردبوویەوە.

عەلی کوڕی بولەیق، ئەحمەد کوڕی زیرەکی لەکۆشکی خەلیفەدانا و فەرمانی پێدا بارودۆخ لەقاهیر دژوار بکات و هەرکەس دەرواتە ناو کۆشك یا دەرواتەدەر، بپشکنێت و سەرپۆشت لەروخساری ژنان هەڵگرێت و ئەگەر نامەی بەکەسێك بینی، تەسلیم مونسی بکات. ئەحمەد کوڕی زیرەك ئەو کارەی دەکرد و زیاتر لەوەیشی دەکرد تا ئەو جێگەی ڕۆژێك شیریان بۆ خەلیفە برد و ئەحمەد دەستی کردە ناو شیرەکە بۆ ئەوەی بزانێت نامەی تیایە یا نە. بولیەق کەسانی وەك دایکی موقتەدر و کەسانی دیکەی ناو کۆشکی لەماڵەکەی خۆی زیندانی کرد و مانگانەی

ئەوانی بڕی.

دایکی موقتەدر، لەبەر ئەوەی قاهیر ئەشکەنجەی کردبوو، نەخۆشییەکەی پەرەی سەند. عەلی کوڕی بولەیق ڕێزی گرت و پەرەستاری ئەوی بەدایکی خۆی سپارد. بۆ تیمار کردنی ئەو هەوڵیدا بەلأم ئەنجامی لێ نەکەوتەوە و دایکی موقتەدر لەجومادی الاخر/ ئاوریل مرد. ئەو لەکاتی مەرگ ڕێزدار و بێ نیاز بوو. ئەو لەناو گۆڕەکەی خۆی لەروسافە بەخاك سپێردرا.

عەلی کوڕی بولەیق لەدژوار کردنی بارودۆخ لەسەر قاهیر بەردەوام بوو. قاهیر دەیزانی هەرچی لەگەڵ عەلی بکات هیچ سوودێکی نییە چوونکە ئەو فەرمانەکانی مونس و باوکی عەلی کوڕی موقلە ئەنجام دەدات. لەبەر ئەمە ئەندێشەی لەرێگە چارەیەك سەبارەت بەم دەستەیە کردەوە.

ئەو لەخراپەخوازی تەریفی سوبکەری و بوشرا، کۆیلەی مونس بۆ بولەیق و منالەکەی ئاگادار بوون و دەیزانی ئەم دوانە چاوی تەماحیان بڕیوەتە شوێنەکەی عەلی. ئەوانی دژی بولەیق و کوڕەکەی هاندا. قاهیر هەروەها دەیزانی مونس و بولەیق زیاتر پشتیان بەسوپاکەی ساجییە، هاوەلأنی یوسف کوڕی باوکی ساج و ئەو کۆیلأنە بەستووە کەدواتر پەیوەستی ئەوان بوون. ئەم دوانە لەموسڵ چەندین بەڵێن و مژدەی دڵخۆشکەریان بەم سوپایەدا بوو بەلأم هیچیان نەهێنایەدی. قاهیر کەسی بۆ لای ئەوان نارد و دژی مونس و بولەیق هانیدان و سوێندی خوارد ئەوەی ئەوان نەیانهێناوەتەدی، خۆی بەدیدێنێت. بەم شێوەیە سوپای ساجییە دڵ کرمێ بوون. قاهیر دواتر کەسی بەشوێن باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسم کوڕی عوبەیدالله لەهاوەلأنی باوکی عەلی کوڕی موقلە نارد کەبەردەوام کوڕی موقلە راوێژی پێدەکرد. قاهیر بەڵێنی وەزارەتی بەباوکی جەعفەردا. باوکی جەعفەر، قاهیری لەرووداو و هەواڵەکان ئاگادار دەکردەوە و کوڕی موقلە ئاگادار بوویەوە بارودۆخی قاهیر گۆڕانی بەسەر هاتووە و هەوڵ دەدات دژی ئەو و مونس و بولەیق و منالەکەی بولەیق و حەسەن کوڕی هارون پیلان دابڕێژێت. کوڕی موقلە ئەوانی لەم پیلانە ئاگادار کردەوە.

## گرتنی مونس و بولەیق

لەشەعبان/ جولای ئەم ساڵە قاهیر باللە، بولەیق و کوڕەکەی و مونسی موزەفەری گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك کوڕی موقلە ئەندێشەی قاهیری بۆ لەناو بردنی مونس و بویەلق بەوان ڕاگەیاند و ئەوانی ئاگادار کردەوە، هەموویان ترسان و بۆ دوورخستنەوەی قاهیر لەخەلافەت هەوڵیاندا و بەڵێنیاندا لەجێگەی ئەو باوکی ئەحمەد کوڕی موکتەفی بێننە سەرتەختی خەلافەت. بولەیق و عەلی کوڕی بولەیق و باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەزیر و حەسەن کوڕی هارون سوێندیان بۆ خوارد و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. دواتر مونسیان ئاگادار کردەوە. مونس وتی: من لەخراپەکاری و خراپەخوازی قاهیر دوو دڵ نیم و لەسەرەتاوە حەزم بەخەلافەتی ئەو نەدەکرد و پێشنیاری کوڕی موقتەدرم پێکردن بەلأم ئێوە رازی نەبوون بەلأم ئێستا بۆ کەم بایەخ کردنی ئەو زێدەڕۆیی دەکەن و ئەویش بۆ ئەم بارودۆخە خۆڕاگری دەکاتە پیشە و بیر لەپیلان دژی ئێوە دەکاتەوە، کەواتە پەلە مەکەن و خۆتان لەو نزیك بکەنەوە تا ئەویش بڕوا بەئێوە بێنێت و بەم شێوەیە بتوانین ئەو سەرکردانەی سوپای ساجیە و کەسانی دیکە کەهاوکاری ئەو دەکەن، بناسین. دواتر بیر لەخەلافەتی کەسێکی دیکە بکەنەوە. عەلی کوڕی بولەیق و حەسەن کوڕی هارون وتیان: پێویست بەم کارانە ناکات چوو ٠ە پەردەداران و کۆشك لەدەستی ئێمەدایە و ئێمە بۆ گرتنی ئەو پێویستمان بە ..س نییە. ئەو هاوشێوەی باڵندەی ناو قەفەس گرفتارە.

بەم شێوەیە بۆ لابردنی قاهیر پەلەیان کرد تا ئەوەی ڕۆژێك بولەیق لەئەسپەکەی کەوتەخوار و خانەنشین بوو. عەلی کوڕی لەگەڵ باوکی عەلی کوڕی موقلە یەکیانگرت و لابردنی قاهیریان لەخەلافەت لەبەرچاوی مونس گەورە و دەرئەنجامەکانیان بەکەم بەها لەقەڵەمدا. مونس مۆڵەتی ئەو کارەی پێدان. ئەو دووانە بڕیاریاندا وا نیشان بدەن باوکی تاهیری قەرەمتی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕۆشتنە ناو کوفە و عەلی کوڕی بولەیق لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی ئەو دەڕوات تا ڕێگە نەدات هێرش بکاتە سەر بەغداد. کاتێك عەلی کوڕی بولەیق ڕۆشتە بارەگای

قاهیر بۆ ئەوەی ماڵئاوایی و مۆڵەتی فەرمانڕەوایەتی لەدەست بگرێت و بتوانێت لەدەرفەتێکی گونجاو، قاهیر بگرێت.

کاتێك ئەم دووانە بۆ ئەم پیلانە پەیمانیان بەست، کوڕی موقلە لەناو خەڵکان دانیشت و دواتر بەئەبوبەکر کوڕی قەرابەی وت: ئایا دەزانی قەرەمتی لەگەڵ شەش هەزار جەنگاوەری شمشێر بەدەست، ڕۆشتۆتە ناو کوفە؟ ئەبوبەکر وتی: نە. کوڕی موقلە وتی: نوێنەرەکانمان ئەو هەواڵەیان بۆ نووسیوین. ئەبوبەکر وتی: ئەمە درۆیە و ئەگەری نییە، دراوسێکەی ئێمە پیاوێکە خەڵکی کوفە و ئەمڕۆ بەکۆتر نامەیەکی بەدەست گەیشت و باس لەئارامی ئەو شارە دەکات. کوڕی موقلە وتی: سبحان الله، ئایا ئێوە زیاتر لەئێمە ئاگاداری هەواڵەکانن؟ ئەبوبەکر بێدەنگ بوو. کوڕی موقلە نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و لەم پێشهاتە ئاگاداری کردەوە. ئەو بۆ قاهیری نووسی: من بۆ عەلی کوڕی بولەیق سوپایەکەم ئامادە کردووە و ئەمڕۆ بەرێدەکەوێت. ئەو دوای نیمەڕۆ دێتە بارەگای تۆ بۆ ئەوەی فەرمانەکانی ئێوە ببیستێت. قاهیر سپاس نامەیەکی بۆ نارد و مۆڵەتی ڕۆشتنی بەکوڕی بولەیقدا. نامەکە کاتێك بەدەستی کوڕی موقلە گەیشت کەخەوتبوو. نامەکەیان لەسوچێکدا دانا و تەسلیمی ئەویان نەکرد. کاتێك کوڕی موقلە لەخەو هەستا، نامەیەکی هاوشێوەی نامەی یەکەم نووسی. قاهیر ئەم کردەوەی بەقێزەون لەقەڵەمدا چوونکە پێشتر وەڵامی نامەکەی دابوویەوە. ترسا لەوەی نەکا فرت و فێڵ لەئارادا بێت.

قاهیر بیری لەم ئەندێشەیە دەکردەوە کەنامەیەکی لەتەریفی سوبکەرییەوە بەدەست گەیشت کەتیایدا نووسرابوو هەواڵێکی بۆ خەلیفە پێیە و لەبەر ئەوە ناچار بووە بەجل و بەرگی ژنانەوە بێت. قاهیر ڕۆشتە لای و تەریف لەهەموو هەواڵ و پێشهاتەکان ئاگاداری کردەوە و پێی وت کوڕی بولەیق دەیەوێت لەکاتی هاتنە ناو کۆشك ئەو بگرێت و ئەوەی ئەوان دەستی بەیعەتیان بۆ ئەحمەد کوڕی موکتەفی درێژ کردووە. قاهیر کاتێك ئەمەی بیست، وشیار بوویەوە و پەیکی بۆ لای سوپای ساجییە نارد کەبڵاوەیان لێکردبوو. ئەوانی کۆکردەوە و هەموویانی لەناو ڕێڕەو و ڕێگەکانی ناو کۆشك شاردەوە. عەلی کوڕی بولەیق لەکاتی ئێوارێ هات.

ئەو مەی خواردبوویەوە و ژمارەیەکی کەمی کۆیلە بەسیلاحی سوك هاوڕێیەتیان دەکرد. عەلی فەرمانی بەدەستەیەك لەسوپاکەیدا سوار لەسەر ئەسپ لەدەورووبەری کۆشك بمێننەوە. ئەو لەبەلەمەکەی دابەزی و داوای مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووری کرد. قاهیر مۆڵەتی پێنەدا. عەلی توڕە بوو و بەشێوەیەکی توند قسەی کرد و وتی: ئەو دەبێت چاوی بەمن بکەوێت، چ بخوازێت، چ نەخوازێت.

وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، قاهیر سوپای ساجییەی لەناو کۆشکدا جێگیر کردبوو. قاهیر فەرمانی بەم سوپایەدا عەلی دووربخەنەوە و جوێنبارانی خۆی و باوکی بکەن. ئەوان شمشێریان دەرکێشا و هێرشیان کردە سەر ماڵەکەی. هاوەڵانی عەلی هەڵاتن. ئەو خۆی خستە ناو بەلەمێك و دەستبەجێ بەرەو ڕۆژئاوا هەڵات و خۆی شاردەوە. کوڕی موقلە ئاگادار بوویەوە. ئەو و حەسەن کوڕی هارونیش خۆیان داشارد.

کاتێك تەریف ئەم هەواڵەی بیست، لەگەڵ هاوەڵانی سوار ئەسپ بوو و ئامادە بۆ جەنگ خۆی گەیاندە کۆشکی خەلیفە. قاهیر لەناو سوپاکەی وەستا و بارودۆخ لەعەلی کوڕی بولەیق و هاوەڵانی دژوار بوو. بولەیق ئەو بەڵای بەسەر کوڕەکەی هاتبوو، بەقێزەون لەقەڵەمدا و جوێنبارانی سوپاکەی ساجییەی کرد و وتی: دەبێت بەرەو کۆشك بڕۆم، ئەگەر سوپای ساجییە بێ فەرمان ئەم کارەیان کردبێت، ئەو بەڵایان بەسەر دێنم کەشیاون بۆی و ئەگەر فەرمانی ئەو کارەیان پێدرابێت، هۆکارەکەی لەخەلیفە دەپرسم.

ئەو لەگەڵ سەرکردەکانی ماڵەکەی مونس هاتە کۆشك بەڵام قاهیر مۆڵەتی سەردانی پێنەدا و فەرمانیدا قۆڵبەست و زیندانی بکەن. هەروەها فەرمانیدا ئەحمەد کوڕی زیرەك، فەرماندەی پاسەوانەکان بگرن. سوپا بەتەواوی لەکۆشکی قاهیر کۆبببوویەوە. قاهیر کەسێکی بۆ لای سوپا نارد و ئەوانی ئارام و هێور کردەوە و بەڵێنی زیاد کردنی مانگانەی پێدان. ڕایگەیاند گیراوەکان بەپێی گوناحەکەی خۆیان قۆڵبەست و زیندانی کراون و دواتر ئازادیان دەکات و پێگەی بەرزیان پێدەبەخشێت. بەم شێوەیە سەربازەکان کۆشکیان بەجێهێشت. قاهیر نامەیەکی بۆ مونس نووسی و داوای لێکرد بێتە کۆشك تا سەبارەت بەسزادانی

گیراوەکان راوێژی پێ بکات. قاهیر نووسیبووی هاوشێوەی باوك لەمونس دەڕوانێت و ناخوازێت بێ راوێژ کردن بەو هیچ کارێك ئەنجام بدات. مونس لەهاتن داوای بەخشینی کرد چوونکە هاورێکانی رێگەیان نەدا بەرەو کۆشك بڕوات.

بۆ بەیانی قاهیر، تەریفی سوبکەری بانگ کرد و ئەنگوستیلەکەی خۆی پێدا و وتی: من ئەوەی موقتەدر بەمحەممەدی کوڕی سپاردبوو، بەعەبدسەمەدی کوڕم دەسپێرم و پێشکاری ئەو و فەرماندەیی سوپا و فەرماندەیی فەرماندەکان و سەرپەرەستی گەنجینە دەخەمە ئەستۆی تۆ، بەهەمان شێوە کەپێشتر لەژێر دەست و فەرمانی مونسدا بوو. هەنووکە بەرەو ماڵی ئەو بڕۆ و بیهێنە چوونکە تا ئەو کاتەی مونس لەماڵەکەی خۆیدایە، ئاژاوەچییەکان بەردەوام لەماڵی ئەو کۆدەبنەوە و ئاژاوە دەنێنەوە بەلآم ئەو لێرە لەئەماندا دەبێت و ئەو کەسانەی رۆژانە خزمەتی دەکەن، لێرە خزمەتی دەکەن.

تەریف بەرەو ماڵی مونس بەرێکەوت. هاوەڵە شمشێر بەدەستەکانی مونس لەدەروی بوون بەلآم پیری و لاوازی بەسەریدا زاڵ ببوو. هاوەلآنی مونس لەتەریف سەبارەت بەچەندایەتی و چۆنایەتی بارودۆخ پرسیاریان کرد و تەریف لەخراپەکاری بولەیق و کوڕەکەی ئاگاداری کردنەوە و هاوەلآنی مونس ئەو دوانەیان جوێنباران کرد. تەریف پێی وتن ئەمانی بۆ هەموان لەقاهیر وەرگرتووە. ئەوان بێدەنگ بوون. تەریف ڕۆشتە لای مونس و داوای لێکرد بڕواتە لای قاهیر. تەریف پێی وت: ئەگەر کەمتەرخەمی بکەیت، قاهیر تەماحی دەبزوێت بەلآم ئەگەر خەوت لێ بکەوێت، بەئاگات ناهێنێتەوە. تەریف لەسەر بنەمای ئەوەی ئاماژەی پێدەدرێت، لەگەڵ مونس و هاوەلآنی ئەو دوژمن و نەیار و دەیویست مونس گرفتار و لەناو بچێت. مونس بەرەو بارەگای قاهیر بەرێکەوت و کاتێك گەیشت، قاهیر قۆلبەست و زیندانی کرد و رێگەی بینینی پێنەدا.

تەریف دەڵێت: کاتێك قاهیرم لەهاتنی مونس ئاگادار کردەوە، جەستەی لەرزی و ڕەنگ بەروخسارییەوە نەما. لەناو جێگەکەی راچەنی. ترسام باسی مونس بکەم و لەوێ زانیم بەهەڵەدا چووم و پەشیمان بوومەوە و دڵنیا بووم لەوەی بەزووترین کات منیش پەیوەستی ئەوان دەبم. لەو کاتەدا کەوتمە بیری ئەم وتەی مونس

کەدەیوت ئەو کەم ئاوز، نەزان، بێ شەرم و خراپەکارە، بەڵام هەڵاتن لەچارەنوسی خواوەند ئەگەری نییە.

کوڕی موقلە نۆ مانگ و سێ رۆژ وەزارەتی لەدەستدا بوو. دواتر قاهیر لەمانگی شەعبان/ جولای، باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسم کوڕی عوبەیدالڵەی وەك وەزیر دەستنیشان و خەڵاتی پێبەخشی.

قاهیر کەسانێکی ڕەوانە کرد تا ماڵەکانی مونس، بولەیق، عەلی کوڕی بولەیق، کوڕی موقلە، ئەحمەد کوڕی زیرەك و حەسەن کوڕی هارون زەوت بکەن. ئەو دەستی بەسەر چوارپێکانی ئەوانیشدا گرت و پاسەوانی بۆ چاودێری کردنی بنەماڵەکانی ئەوان دانا. کەسێکی بۆ لای عیسای پزیشك لەموسڵ نارد و ئەوی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد و فەرمانیدا ماڵی کوڕی موقلە تالآن بکەن و بیسوتێنن. ماڵی کوڕی موقلە و کەسانی ئەویان تالآن کرد و سووتاندیان. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی یاقوت( کەخۆی شاردبوویەوە) خۆی ئاشکرا کرد و بوو بەپەردەداری خەلیفە بەڵام کاتێك هەستی کرد تەریفی سوبکەری و سوپای ساجییە لەو ڕەشبینن، بۆ لای باوکی لەفارس هەڵات و خۆی شاردەوە. قاهیر نامەیەکی بۆ نووسی و بۆ هەڵاتنەکەی سەرکۆنەی کرد و ئەهوازی خستە ژێر فەرمانی ئەو.

چۆنیەتی پەیوەست بوونی تەریف و سوپای ساجییە و بەردهاوێژەکان بەقاهیر و پیلان و دەسیسەی ئەوان دژی مونس و بولەیق بەم شێوەیە بوو: تەریف یەکێك لەبەرزترین و گەورەترین سەرکردەکانی مونس بوو و بولەیق و کوڕەکەی لەخزمەتی مونسدا بوون و دەستیان ماچ دەکرد. کاتێك قاهیر هاتە سەرکار، بولەیق و کوڕەکەی پێگەیان بەرز بوویەوە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا لەدەوڵەتی قاهیر بەخواستی دڵی خۆیان دەجووڵانەوە. کوڕی بولەیق، تەریفی پشتگوێ خست و دەستی بەسەر سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەودا گرت. کاتێك بێ ئیشی تەریف درێژەی کێشا، بولەیق شەرم دایگرت و ترسی ئەوی کەوتە دڵەوە و بڕیاریدا فەرمانڕەوایەتی میسری پێ ببەخشێت تا هەم مافی بۆ گەڕاندبێتەوە و هەم ئەوی دوور کردبێتەوە و لەسوپاکەی لەئەماندا بێت. ئەم مەبەستەی لای باوکی عەلی کوڕی موقلە باس کرد و وەزیر، پەسەندی کرد. بولەیق داوای بەخشینی لەتەریف

کرد کەبۆ ماوەیەکی زۆر بێ ئیش بووە و ئەوی لەفەرمانڕەوایەتی میسر ئاگادار کردەوە. تەریف سپاسی کرد بەڵام عەلی کوڕی بولەیق ڕێگەی نەدا ئەم فەرمانە جێبەجێ بکرێت و خۆی فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی گرتەدەست و نوێنەرێکی خۆی بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد. بەم شێوەیە تەریف ڕق ئەوانی گرتەدڵ و بۆسەی نایەوە.

سوپای ساجییە، هێز و توانای مونس بوون کە لەگەڵ ئەو ڕۆشتنە موسڵ و لەگەڵ ئەو دژی موقتەدر جەنگان. مونس بەڵێنی زیاد کردنی مانگانەی پێدابوون بەڵام کاتێك موقتەدر کوژرا، بەڵێنەکانی سوپای ساجییە نەهاتەدی. کوڕی بولەیق لێی جیابوویەوە و پشتی کردە سوپای ساجییە.

یەکێك لەسەربازەکانی سوپای ساجییە ڕەشپێستێك بوو بەناوی سەندەڵ. ئەو بەیەکێك لەسەرکردەکانی ئەم سوپایە دادەنرا. سەندەڵ کۆیلەیەکی بوو بەناوی مۆئتەمەن. ئەم کۆیلەی فرۆشت. ئەم کۆیلەیە پێش خەلافەتی قاهیر پەیوەستی بوو و کاتێك قاهیر لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، پێگەیەکی بەرزی بەم کۆیلەیە بەخشی و ئەوی کردە لێپرسراوی گەیاندنی نامەکانی خۆی. کاتێك قاهیر گرفتاری خراپەکاری کوڕی بولەیق بوو، هاوشێوەی کەسێکی نقووم بوو دەستی بۆ هەر شتێك درێژ دەکرد. قاهیر زانا و فریودەر بوو. فەرمانی بەمۆئتەمەندا بڕواتە لای سەندەڵ و سکاڵا لەقاهیر بکات. ئەگەر ئەو بەوتەکانی مۆئتەمەن ڕازی نەبوو، بەسەرهاتی قاهیر و گرفتاری ئەو لەدەست بولەیق و کوڕەکەی بێنێتە سەرزمان و ئەگەر جیاواز لەوە بوو، بێدەنگ بێت و هیچ باس نەکات. مۆئتەمەن ڕۆشت و فەرمانەکەی ئەنجامدا.

کاتێك مۆئتەمەن گلەیی لەقاهیر کرد، سەندەڵ پێی وت: قاهیر بۆ چ کارێك خەلیفەیە تا بەتۆ ببەخشێت و کەسێکی مێهرەبان بێت؟ ئەگەر خواوەند خەلیفە لەدەست ئەم خراپەکارە (بولەیق) ڕزگار بکات، من و کەسانی دیکە نیازمەندی تۆ دەبین و من پەیمان دەبەستم ئەگەر خەلیفە بێتەسەرکار، نوێژ دەخوێنم و بەڕۆژوو دەبم و بەم شێوەیە خەلیفە ئاسوودە دەبێت و دواتر ئێمە لەدەست ئەو نفرین کراوە ڕزگار دەکات.

مۆئتەمەن ئەم وتەی بۆ قاهیر گێڕایەوە. قاهیر بەمۆئتەمەندا دیارییەکی گرانبایی لەبۆنی خۆش و شتەکانی دیکە بۆ هاوسەرەکەی سەندەڵ نارد وبەمۆئتەمەنی وت: ئەم دیارییانە کاتێك بەدەستی هاوسەری سەندەڵ دەگەیێنێت کەخۆی ئامادە نەبێت و بەهاوسەرەکەی دەڵێیت: خەلیفە هەندێ شتی لەناو ئێمەدا بەخشیوەتەوە و ئەمە بەشی منە و پێشکەشی دەکەم بەتۆ. مۆئتەمەن ئەو کارەی کرد و هاوسەری سەندەڵ دیارییەکانی وەرگرت. خەلیفە بەمۆئتەمەنی وت: سەیری دواهاتەکانی ئەم کارە بکە. مۆئتەمەن رۆشتە لای هاوسەری سەندەڵ و لەکاریگەری ئەو دیارییانە پرسیاری کرد. هاوسەری سەندەڵ وتی: فلأن و فیسارە کۆبوونەوە –ناوی شەش کەسی برد– دیارییەکانی تۆیان بینی و لەو بۆنە خۆشەیان لەخۆیاندا و بۆ خەلیفە پاڕانەوە.

لەم کاتەدا سەندەڵ هات و مۆئتەمەنی لای هاوسەرەکەی خۆی بینی. سەندەڵ سپاسی کرد و لەتەندروستی خەلیفەی پرسی و ئەوی بەکەسێکی بەخشندە، وەسف کراو، رێزدار ناو برد. سەندەڵ وتی: کوڕی بولەیق خەلیفە بەبێ دین لەقەڵەم دەدات وئەنجامدانی کارە قێزەونەکان بۆ ئەو دەگەڕێنێتەوە. مۆئتەمەن سوێندی خوارد هەموو وتەکانی بولەیق لەراستییەوە دوورن.

قاهیر فەرمانیدا مۆئتەمەن بڕواتە لای هاوسەری سەندەڵ و ئەو بێنێتە لای پێشکارەکەی (ژن) قاهیر. هاوسەری سەندەڵ بەجل و بەرگی ماما، کەکەسانی دەوروبەری قاهیر پێی ئاشنا بوون، هات. ئەو هاوشێوەی مامانێك بۆ پشکنینی ژنێکی دوو گیان شەوێك لەکۆشکی کوڕی تاهیر مایەوە و دواتر قاهیر بەودا نامەیەکی بۆ هاوسەرەکەی و سەرکردەکانی دیکەی سوپای ساجییە نارد و بەدەستی خۆی بەڵێنی پێدانی زەوی و کەنیزی پێدان. بڕێك پارەی بەهاوسەرەکەی سەندەڵ بەخشی. هاوسەری سەندەڵ بۆ لای سەندەڵ گەڕایەوە و مێردەکەی لەبارودۆخ ئاگادار کردەوە. کوڕی بولەیقیان ئاگادار کردەوە کەژنێك لەکۆشکی کوڕی تاهیر ڕۆشتۆتە بارەگای خەلیفە. لەمەودا چیتر کوڕی بولەیق مۆڵەتی ڕۆشتنە ناو کۆشکی بەهیچ ژنێك نەدەدا مەگەر ئەوەی ببینرێت و بناسرێت.

سوپای ساجییە سەرکردەیەکیان بوو بەناوی سیما کەهەمووان گوێرایەڵی وتە و فەرمانەکانی بوون. سەندەڵ و هاوەڵانی سیمایان لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە چوونکە پێویستیان بەو بوو. نامەکەی قاهیریان نیشاندا. سیما وتی: کاری راست ئەوەیە و دەرئەنجامێکی باشی لێدەکەوێتەوە بەڵام دەبێت دەستەیەك لەهاوەڵە خاوەن دەسەڵاتەکانی بولەیق و مونس لەم کارەدا بەشدار بن و بەم شێوەیە هەموویان لەسەر تەریفی سوبکەری رێککەوتن و وتیان: ئەویش تورەیە. ڕۆشتنە لای مونس و وتیان: ئەگەر ئوستاد – ئەویان بەم شێوەیە بانگ دەکرد– خۆی رێبەرایەتی کارەکانی دەکرد، ئێمە بەخواستەکانی خۆمان دەگەیشتین بەڵام مونس کەمتەرخەمی لەخۆی نیشاندا و کوڕی بولەیق جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست و خۆبینی و خۆپەسەندی کردە پیشە. ئەوان چەندین جار تەریفیان بەتوڕەیی بینی و سەرئەنجام لەمەبەستەکەی خۆیان ئاگاداریان کردەوە. تەریف بەپێشنیارەکەیان رازی بوو بەڵام هەموویانی سوێنددا بۆ ئەوەی هیچ زیانێکی مادی و گیانی لەمونس و بولەیق و کوڕەکەی نەدەن. تەنیا بولەیق و کورەکەی خانەنشین بکەن بێ ئەوەی لەپێگەی مونس کەم بکەنەوە. ئەوان سوێندیان خوارد و تەریف سوێندی بۆ خواردن. دواتر فەرمانیدا مەبەستەکەی بۆ قاهیر بنوسن و ئەوان هەموو بەسەرهاتەکەیان بۆ قاهیر نووسی. قاهیر بەداواکانیان رازی بوو و زیادی کرد: لەگەڵ خەڵکان نوێژ دەخوێنێت و لەرۆژی هەینی وتارێك دەخوێنێتەوە. بۆ لێکۆڵینەوە لەکێشەی خەڵکان دادەنیشێت و دادی ئەوان وەردەگرێت و بەڵێنی هەموو کار و کردەوەیەکی چاکەکارانەی پێدان.

لەم کاتەدا تەریف دەستەیەك لەسەرکردەی بەردهاوێژەکانی کۆکردەوە کەکوڕی بولەیق ئەوانی لەخۆی دوور کردبوویەوە و جێگەی ئەوانی بەهاوەڵانی خۆی پڕکردبوویەوە. ئەم دەستەیە ڕقی کوڕی بولەیقیان لەدڵدا بوو. کاتێك تەریف لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردنەوە، بێ چەند و چوون رازی بوون. بەشێك لەگفتوگۆی ئەوان بەگوێی کوڕی موقلە و کوڕی بولەیق گەیشت بەڵام بەتەواوی لەهەموو شتێك ئاگادار نەبوونەوە لەبەر ئەمە ویستیان دەستەیەك لەسەرکردەکانی سوپای ساجییە و بەردهاوێژەکان بگرن بەڵام لەترسی دروست بوونی ئاژاوە

لەمەبەستەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە.

قاهیر وای نیشاندا گرفتاری نەخۆشی دومەڵ و هاوشێوەکانی بۆتەوە و لەترسی خەڵکان، کەسی نەدەبینی و جگە لەکۆیلە تایبەتییەکانی کەس ئەوی نەدەبینی. کاتی بینینی کۆیلەکانیش کورت خایەن بوو. بەم شێوەیە بینینی قاهیر بۆ کوڕی موقلە و کوڕی بولەیق دژوار بوو و نەیاندەتوانی لەمەبەست و خواستەکانی خۆیان ئاگاداری بکەنەوە. بەناچاری داستانی هێرشی قەرەمتییەکانیان دروست کرد – پێشتر ئاماژەمان پێدا تا ئەو بەلای بەسەر بێنن کەپیلانیان بۆ دارشتبوو و کاتێك قاهیر، مونس و هاوەڵانی ئەوی گرت، سەلامەی تولونی کردە پەردەداری خۆی و باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی خاقانی وەك فەرماندەی پاسەوانەکان و باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسم کوڕی عوبەیداللەی وەك وەزیر هەڵبژارد و فەرمانیدا جاڕ بدەن هەرکەس خۆی شاردۆتەوە، خۆی ئاشکرا بکات و هەرکەس ببێتە داڵدە و پەنای ئەو کەسانە، سامانی ئەوان ڕەوا دەبێت و ماڵەکەی بەسەردا خاپور دەکرێت. ئەو بۆ گرتنی ئەحمەد کوڕی موکتەفی زۆری هەوڵدا و سەرئەنجام گرتی و بەچوار دەوری ئەودا دیوارێکی بەرز کردەوە و بەم شێوەیە بەزیندوویی لەناوی برد. قاهیر هەروەها عەلی کوڕی بولەیقی کوشت.

## کوژرانی مونس، بولەیق، عەلی کوڕی بویەلق

لەشەعبان/ جولای ئەم ساڵە قاهیر، مونسی موزەفەر، بولەیق و عەلی کوڕی بولەیقی کوشت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: هاوەڵانی مونس یاخی بوون و ئاژاوەگێڕییان دەست پێکرد و سەربازەکانی دیکەی شوێنیان کەوتن و پەنجێرەی ماڵی باوکی جەعفەری وەزیریان شکاند و هاواری مونس، مونسیان بەرز کردەوە و وتیان: تەنیا بەئازادی مونس، رازی دەبین.

قاهیر کەعەلی کوڕی بولەیقی گرفتار کردبوو، هەرکام لەباوك و کوڕی لەماڵێکی جیاواز زیندانی کردبوو. کاتێك سوپا شۆڕشی کرد، قاهیر هاتە لای عەلی کوڕی بویەلق و فەرمانیدا سەری ببڕن و بیخەنە ناو تەشتێك. قاهیر لەکاتێکدا تەشتەکەیان دەبردە لای، ڕۆشتە لای بولەیق و تەشتەکەی لەبەردەم ئەودانا کەسەری کوڕەکەی تیابوو. بولەیق کاتێك سەیری سەری بڕاوی کوڕەکەی کرد، فەرمێسك لەچاوی هاتە خوار. سەرەکەی هەڵگرت و ماچی کرد و خوێنەکەی دەخواردەوە. لەم کاتەدا قاهیر فەرمانی سەر بڕینی ئەویشی دەرکرد. سەریان بڕی و لەبەردەم قاهیر دایاننا. ئەو هەردوو سەرە بڕاوەکەی هەڵگرت و ڕۆشتە لای مونس و دوو سەرە بڕاوەکەی لەبەردەم ئەودانا. کاتێك مونس چاوی بەدوو سەرە بڕاوەکە کەوت، ڕشایەوە و نفرینی بکوژی ئەوانی کرد. قاهیر وتی: ئەم سەگە نفرین کراوە لەسەر زەوی راکێشن. ئەویان لەسەر زەوی راکێشا و سەریان بڕی و خستیانە ناو تەشتێك. قاهیر فەرمانیدا سەرە بڕاوەکان بەناو بەغداد بگەڕێنن و جاڕیاندا کە: ئەمەیە سزای ئەو کەسەی خیانەت لەپێشەوای خۆی دەکات و بۆ لەناو بردنی فەرمانڕەوایی ئەو تێدەکۆشێت. دواتر سەرەکانیان گەڕاندەوە، پاکیان کردنەوە و وەك نەریتی هەمیشەیی لەناو هەنباری سەرە بڕاوەکان کەڵەکەیان کردن.

دەڵێن: بولەیق کاتێك کوژرا کەکوڕەکەی خۆی شاردبوویەوە و دواتر قاهیر کوڕەکەی گرت و فەرمانیدا ئەشکەنجەی بکەن. لەم کاتەدا کوڕەکەی بولەیق ناشیرینترین و قێزەونترین جوێنەکانی بەقاهیردا و بەم شێوەیە قاهیر فەرمانیدا

سەری ببڕن و سەرەکەیان لەناو بەغداد گەڕاند. قاهیر دواتر کەسانێکی بۆ گرتنی یەعقوبی نەوبەختی – لەناو کۆڕی دانیشتنی وەزیرەکەی محەممەد کوڕی قاسم بوو– نارد و ئەویان زیندانی کرد. خەڵك قاهیریان بەکەسێکی سەختگیر بینی و دڵنیا بوون لەوەی لەدەستی ئەو رزگاریان نابێت. هەرکەس هاوکاری ئەوی کردبوو، وەك سەبوك، سوپای ساجییە یابەرد هاوێژەکان پەشیمان بوونەوە بەڵام چیتر پەشیمانی سوودی نەبوو.

## وەزارەتی باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسم و لابردنی ئەو و هاتنە سەرکاری خوسەیبی

کاتێ: قاهیر، مونس، بولەیق و کوڕەکەی گرت، بەدوای کەسێکدا گەڕا کەبۆ وەزارەت شیاو بێت. کەسانی دەوروبەر باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسم کوڕی عوبەیداللەیان پێشنیار کرد و ئەو باوکی جەعفەری وەك وەزیر هەڵبژارد. باوکی جەعفەر تا سێ شەممە سیانزەی زیقەعدە/ شەشی نۆڤەمبەر وەك وەزیر مایەوە تا ئەو کاتەی قاهیر کەسی نارد بۆ ئەوەی خۆی و منداڵەکان و کەسانی خێزانەکەی دەستبەسەر و قۆڵبەست بکات و ئەوی بۆ ماوەی هەژدە رۆژ زیندانی کرد لەکاتێکدا گرفتاری قۆڵنج بوو. باوکی جەعفەر مرد و جەنازەی بێ گیانی ئەویان بۆ ماڵەکەی بردەوە. دواتر قاهیر منداڵەکانی ئازاد کرد و باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی عوبەیداللە کوڕی سلێمانی خوسەیبی وەك وەزیر هەڵبژارد. وەزارەتی باوکی جەعفەر سێ مانگ و دوانزە رۆژ درێژەی کێشا.

## گرتنی تەریفی سوبکەری

کاتێك بارودۆخ بۆ قاهیر سەقامگیر و مونس و هاوەڵانی ئەوی گرت و کوشتاری کردن، لەسەر ئەو سوێند و پەیمانەی بەتەریفیدابوو، پێبەند نەبوو. قاهیر ئەو وتانەی بەتەریف دەوت کەپێی خۆش نەبوو. بەردەوام ئەوی بەبچوك و ریسوا لەقەڵەم دەدا و ئازاری دەدا. کاتێك تەریف ئەم بارودۆخەی بینی، دڵنیا بوو لەوەی قاهیر دەیگرێت و دەیکوژێت. وەسیەت نامەی نووسی و لەهەموو ئەرك و لێپرسراویەتییەکان دەستی کێشایەوە.

قاهیر پشتی تێکرد و بیری لەگرتنی وەزیر و کەسانی دیکەی کردەوە و دوای گرتنی وەزیرەکەی، باوکی جەعفەر، تەریفی بانگ و قۆڵبەستی کرد. تەریف لەزیندان لەبەرەبەیانەوە تا ئێوارێ چاوەڕوانی مەرگ بوو تا ئەوەی قاهیر لەسەر کار لابرا.

## ڕووداوەکانی خوراسان

لەم ساڵەدا مەرداویج لەشاری ڕەی، ڕێگەی جورجانی گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی ئەبوبەکر محەممەد کوڕی موزەفەردا بوو. ئەبوبەکر لەم کاتەدا لەنەخۆشی ڕەنجی دەبرد و کاتێك مەرداویج مەبەستی ئەو شارەی کرد، بۆ نەیشابور گەڕایەوە. لەم کاتەدا سەعید نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی لەنەیشابور بوو. کاتێك محەممەد کوڕی موزەفەر گەیشتە نەیشابور، سەعید هێرشی کردە سەر جورجان. محەممەد کوڕی عوبەیدالله بەڵغەمی بۆ موتەریف کوڕی محەممەد، وەزیری مەرداویج، نامەی نووسی و ڕێزی لێگرت. موتەریف خوازیاری پەیوەست بوون بەو بوو. مەرداویج ئاگادار بوویەوە و موتەریفی گرت و کوشتی.

محەممەد کوڕی عوبەیداللەی بەڵغەمی، پەیامی بۆ مەرداویج نارد: دەزانم تۆ حەز بەناسپاسی کردنی ئەمیر سەعید ناکەیت و موتەریفی وەزیر تۆی ناچار کردووە هێرش بکەیتە سەر جورجان تا دانیشتوانی ئەم شارە هەست بەپێگەی ئەو لای تۆ بکەن بەهەمان شێوە کەئەحمەد کوڕی رەبیعە دەبیری عەمرۆ کوڕی

لەیس ناچاری کرد هێرش بکاتە سەر بەلْخ تا دانیشتوانی بەلْخ هەست بەپێگەی بەرزی ئەو لای عەمرۆ کوڕی لەیس بکەن و ئەو بەلاًی بەسەر هات کەتۆ لێی ئاگاداریت. بەباشی نازانم شەڕ لەگەلْ فەرمانڕەوایەك بکەیت کەسەد هەزار پیاوی جەنگاوەر لەبەندەکانی خۆی وباوکی دەوریان گرتووە. باشتر وایە جورجان بۆ ئەو بەجێبێلْیت و بۆ فەرمانڕەوایی کردن لەڕەی، لەسەر بنەمای ڕەوانە کردنی بڕێك لەباج، ڕێگەی سازان لەگەلْ ئەو بگریتەبەر. مەرداویج ئەو کارەی کرد و لەجورجان چاوی پۆشی و باجی ڕەی ڕەوانە کرد. سەعید فەرمانڕەوایەتی ڕەی بەو سپارد.

## فەرمانڕەوایی محەممەد کوڕی موزەفەر لەخوراسان

کاتێك سەعید لەکێشەکانی جورجان ئاسودە و کاروبارەکانی ڕێکخست، ئەبوبەکر محەممەد کوڕی موزەفەر کوڕی موحتاجی وەك فەرماندەی سوپای خوراسان دەستنیشان کرد و بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارەکانی ئەو سەرزەمینەی پێسپارد و خۆی بۆ بوخارا، سەرزەمینی فەرمانڕەوایەتی خۆی گەڕایەوە.

چۆنیەتی پێش کەوتنی محەممەد کوڕی موزەفەر بەم شێوە بوو ڕۆژێك سەعید لەبارەگاکەی خۆی سەبارەت بەچەندین پرسی گرنگ لەگەلْی ئاخاوت. لەکاتی ئەم ئاخاوتنەدا دوو پشکێك چەندین جار قاچی محەممەد کوڕی موزەفەری گەست بەلاًم ئەو لەشوێنەکەی نەجوولاً و شوێنەواری ئازارەکەی لەروخساری دەرنەکەوت. کاتێك سەعید کۆتایی بەوتەکانی هێنا، محەممەد بۆ مالْەکەی گەڕایەوە، پێلاًوەکانی داکەند و دووپشکەکەی کوشت. سەعید لەم بەسەرهاتە ئاگادار بوویەوە. سەری سوڕما و بەمحەممەدی وت: سەرم سوڕماوە چۆن بەو شێوەیە ئاسوودە گوێت لەقسەکانی من سەبارەت بەبەڕێوبردنی ولاًت گرت، بۆ لەشوێنەکەی خۆت هەلْنەستایت و دووپشکەکەت نەکوشت؟ محەممەد وتی: هەرگیز لەبەر دووپشکێك قسەی گەورەی خۆم نابڕم. ئەگەر لەبەردەم سەروەری خۆم بۆ گەستنی دووپشکێك ناتەوان بم، چۆن دەتوانم دوور لەو بەرگەی شمشێری دوژمنانی فەرمانڕەوایەتی بگرم. بەم شێوەیە پێگەی محەممەد بەرز بوویەوە و سەعید، دووسەد هەزار درهەمی پێبەخشی.

## سەرەتای فەرمانڕەوایی ئال بویە (بنەماڵەی بویە)

ئالی بویە عیماد ئەلدەولە باوکی حەسەن عەلی و روکن ئەلدەولە باوکی عەلی حەسەن و مۆعێز ئەلدەولە باوکی حەسەن ئەحمەد منداڵەکانی باوکی شوجاع بویە کوڕی فەنا خەسرەو کوڕی تەمام کوڕی کوهی کوڕی شیرزیلی بچوك کوڕی شیرکەندە کوڕی شیرزیلی گەورە کوڕی شیران شا کوڕی شیرویە کوڕی سەشتان شا کوڕی سیس فیروز کوڕی شیروزیل کوڕی سەنباد کوڕی بەهرامی گوڕ کوڕی یەزدگێرد کوڕی هورموز کوڕی شاپور کوڕی شاپوری شان کونکەرە بوون کەناوی پشتەکانی دیکەی ئەوان لەسەرەتای کتێبەکە لەکاتی ئاماژەدان بەپاشاکانی ئێران، باسی کراوە. ئەمیر باوکی نەسر کوڕی ماکولا، رەچەڵەکی ئەوانی بەم شێوەیە ئاماژە پێداوە.

کوڕی مسکویە دەڵێت ئەوان خۆیان بەمنداڵەکانی یەزدگێرد کوڕی شەهریار دوایین پاشای ئێرانییەکان دەزانن بەڵام ئاماژەکەی کوڕی ماکولا ڕاستتر بەرچاو دەکەوێت چوونکە پێشەوایەکی زانا لەم زانستەیە وئەمە ڕەچەڵەکێکی بەناوبانگ لەناو ئێرانییەکانە و بێ گومان بۆیە بەدەیلەمییەکان پەیوەند دراون چوونکە ماوەیەکی زۆر لەسەرزەمینی ئەوان ماونەتەوە.

سەرەتای دەرکەوتنی ئەوان بەم شێوە بوو کەباوکی ئەوان باوکی شوجاعی بویە پیاوێکی نەزۆر دەوڵەمەند نەزۆر هەژار بوو. هاوسەری باوکی شوجاع مرد و سێ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت کەپێشتر ئاماژە بەناوی ئەوان درا. کاتێك هاوسەری باوکی شوجاع مرد، خەم و پەژارەی ئەو بۆ لەدەست دانی هاوسەرەکەی زیادی کرد. شەهریار کوڕی ڕۆستەمی دەیلەمی دەڵێت: من هاوڕێی باوکی شوجاعی بویە بووم، ڕۆژێك کەچووم بۆ سەردانی، بۆ خەم و پەژارە خواردن، سەرکۆنەم کرد و وتم: تۆ پیاویت و نابێت خەمبار بیت، خەم و پەژارە ئەم منداڵانە لەپێ دەخات و ئەگەری هەیە یەکێك لەوان بمرێت و خەمی تۆ بۆ لەدەست دانی هاوسەرەکەت دەم بکاتەوە. تا ئەو جێگەی توانیم دڵنەواییم کرد و ئەوم لەگەڵ خۆم برد بۆ ئەوەی خەمەکانی لەبیر بکات. باوکی شوجاع و کوڕەکانیم بردە

ماڵەکەی خۆم بۆ ئەودی بخۆن و خەم بەبا بدەن.

لەم کاتەدا پیاوێك لای ئێمه تێپەڕی کەخۆی بەئەستێرەناس و پێشگۆ و لێکدەرەوەی خەو ناساند و دۆعا و تلیسمی دەنووسی. باوکی شوجاع بانگی کرد و وتی: خەوم بینی کەگمیزم دەکرد بەڵام لەنێرینەی منەوە ئاگرێکی گەورە هاتەدەر و ئەوەندەی نەمابوو بەئاسمانەکان بگات. ئەم ئاگرە دامرکایەوە و بۆ سێ لق دابەش بوو و دووبارە لەو لقانە چەندین لقی دیکە هاتە ئاراوە و جیهان لەبەر تیشکی ئەم ئاگرە رووناك بوویەوە و شارەکان و خەڵکان ملکەچی و فەرمانبەری خۆیان بۆ ئەم ئاگرە نیشاندا.

ئەستێرەناس وتی: ئەمەخەوێکی گەورە و تەنیا بەوەرگرتنی ئەسپ و دیاری گەورە لێکدانەوەی بۆ دەکەم. باوکی شوجاع وتی: سوێند بەخوا جگە لەجل و بەرگی بەرم هیچی دیکەم نییە و ئەگەر تۆ لێم بستێنیت، رووت و قووت دەبم. ئەستێرە ناس وتی: دەدینارم پێبدە. باوکی شوجاع وتی: سوێند بەخوا یەك دینارم نییە چ بگات بەدە دینار. بەهەرحاڵ شتێکی پێدا و ئەستێرەناس وتی: تۆ سێ کوڕت هەیە و بەسەر زەمین و خەڵکانی سەرزەوی زاڵ دەبن و ناوی ئەوان لەهەموو کەنارەکان بەرز دەبێتەوە بەهەمان شێوە کەئاگر بڵێسە دەسەنێت. لەوان دەستەیەکی فەرمانڕەوا چاو بەدنیا هەڵدێنن بەئەندازەی لقی ئەو ئاگرەی لەخەودا بینیوتە. باوکی شوجاع وتی: شەرم ناکەیت گاڵتەمان پێدەکەیت؟ من پیاوێکی هەژارم وئەوانە منداڵەکانی منن کەهەژار و نەدارر چۆن دەبنە فەرمانڕەوا؟ ئەستێرەناس وتی: رۆژی لەدایك بوونی ئەوانم پێ بڵێ. باوکی شوجاع وتی و ئەستێرەناس دەستی بەژماردن کرد و دواتر دەستی باوکی حەسەن عەلی گرت و ماچی کرد و وتی: سوێند بەخوا ئەمە ئەو کەسەیە دەست بەسەر سەرزەمینەکاندا دەگرێت. دوای ئەم، ئەوەیان دێتەسەرکار و دەستی براکەی باوکی عەلی حەسەنی گرت. لەم کاتەدا باوکی شوجاع توڕە بوو و بەکوڕەکانی وت: بەشەقەزللە بکەونە گیانی ئەم زانایە چوونکە لەگاڵتە کردن بەئێمە زێدەڕۆیی کرد. منداڵەکانی لەئەستێرەناسەکەیاندا و ئەو بەردەوام هاواری دەکرد و ئێمە پێی پێدەکەنین. دواتر دەستیان لێ هەڵگرت. ئەستێرەناس بەمنداڵەکانی باوکی شوجاعی وت: ئەم

کردەوەی خۆتان لەگەڵ من لەبیر بێت تا ئەو کاتەی فەرمانڕەوایەتی دەگرنەدەست. ئێمە پێی پێکەنین و باوکی شوجاع دە درهەمی پێدا.

لەم کاتەدا – وەك ئامارژەی پێدرا– دەستەیەك لەدەیلەمییەکان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە بۆ ئەوەی دەست بەسەر شارەکاندا بگرن. ماکان کوڕی کالی، لەیلی کوڕی نوعمان، ئەسفار کوڕی شیرویە و مەرداویج کوڕی زیار لەریزی ئەوانن. هەرکام دەستەیەکی گەورە لەدەیلەمییەکان هاورێیەتیان دەکرد. مناڵەکانی باوکی شوجاع لەناو ئەم دەستانەدا بوون. ئەوان لەناو سوپاکەی ماکان کوڕی کالی شمشێریان دەوەشاند. ئەوسات –وەك ئاماژەمان پێدا– بارودۆخی ماکان دوای مەرگی ئەسفار و زاڵبوونی مەرداویج بەسەر ماکان، چیتر بەیەکگرتوویی نەما و ئەمە کاتێك بوو مەرداویج بەسەر هەموو سنووری فەرمانڕەوایەتی ماکان لەتەبەرستان و جورجان زاڵ بوو و ماکان جارێکی دیکە بەرەو جورجان و دامغان گەڕایەوە و تێکشکاو رێگەی نەیشابوری گرتەبەر.

مناڵەکانی بویە کاتێك سستی و ناتەوانی ماکانیان بینی( پشتیان تێکرد و )عیماد ئەلدەولە و رۆکن ئەلدەولە پێیان وت: ئێمە دەستەیەکین و بووینەتە بارێکی قورس بەسەر شانی تۆ لەکاتێکدا خۆت گرفتاریت. باشتر وایە لەتۆ جیاببینەوە بۆ ئەوەی لەژمارەی هاوەڵانی تۆ کەم بکەینەوە و هەرکات بارودۆخمان سەقامگیر بوو، بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە. ماکان مۆڵەتی بەو دووانەدا و ئەوان پەیوەستی مەرداویج بوون. دەستەیەك لەسەرکردەکانی ماکان رێگەی ئەم دوانەیان گرتەبەر و کاتێك پەیوەستی مەرداویج بوون، مەرداویج بەخۆشحاڵییەوە بەهاتنی رازی بوو. خەڵاتی بەدوو کوڕەکەی بویە بەخشی و رێزی گرتن. مەرداویج بەو سەرکردانەی پەیوەستی دەبوون، فەرمانڕەوایەتی یەکێك لەناوچە کوێستانییەکانی پێ دەسپارد. مەرداویج، عەلی کوڕی بویەی وەك کارگوزاری کەرەج[٢٠] دیاری کرد.

---

[٢٠]– ئەم کەرەجە جیاوازە لەکەرەجی ئێستا کە لەنزیك شاری تارانە و مەبەست لێی ئەراکە و پێشتر بەناوی کەرەجی باوکی دوڵف بەناو بانگ بووە. وەرگێر

## چۆنیەتی پێشکەوتنی عەلی کوڕی بویە

چۆنیەتی پێشکەوتنی عەلی کوڕی بویە لەناو براکانی خۆی، جیاواز لەویستی ڕۆژگار، بەم شێوە بوو کەئەو پیاویکی بەخشندە، دانا و بوێر بوو. کاتێك مەردوایج فەرمانڕەوایەتی کەرەجی پێ سپارد و دەستەیەك لەسەرکردەکانی لەگەڵ ئەو بۆ کەنارەکان ڕەوانە کرد و فەرمان نامەی بۆ نووسین، هەموویان ڕێگەی شاری ڕەی یان گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی وەشمگیر کوڕی زیار، برای مەرداویجدا بوو. حسەین کوڕی محەممەد بەنازناوی عەمید هاورێیەتی ئەوی دەکرد. ئەو باوکی فەزڵ کوڕی عەمید بوو کەوەزارەتی ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویەی لەئەستۆدا بوو. عەمید لەم کاتەدا وەزیری مەرداویج بوو.

عیماد ئەلدەولە ئێسترێکی خۆڵەمێشی ڕەنگی هەبوو کە بەیەکێك لەجوانترین ئێسترەکان هەژمار دەکرا. ئەم ئێسترەی بۆ فرۆش دانا (تا پارەکەی بۆ خەرجییەکان هەزینە بکات) نرخەکەی گەیشتە دووسەد دینار. ئێسترەکەیان نیشانی عەمید دا. ئەو کڕی و پارەکەی نارد. کاتێك پارەی ئێسترەکەیان بردە لای عیماد ئەلدەولە (و زانی کڕیار عەمیدە) دە دینار لەپارەکەی هەڵگرت و ئەوەیتری لەگەڵ دیاری گرانبایی بۆ گەڕاندەوە.

مەرداویج لەوەی سەرکردە ئەمان بەخشراوەکانی وەك فەرمانڕەوای ناوچەکان دیاریکردبوو، پەشیمان بوویەوە و لەبەر ئەمە نامەیە؛ بۆ وەشمگیر و عەمید نووسی تا ڕێگە نەدەن سەرکردەکان بۆ سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆیان بڕۆن و ئەگەر یەکێك لەوان پێشتر بەرێکەوتووە، بیگەڕێننەوە.

نامەکان پێش وەشمگیر بەدەستی عەمید دەگەیشت. عەمید ئەوانی دەخوێندەوە و دواتر تەسلیم بەوەشمگیری دەکرد. کاتێك عەمید لەنامەکە ئاگادار بوویەوە، کەسی بەدوای عیماد ئەلدەولە نارد و فەرمانی پێدا دەستبەجێ بەرەو سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی بەرێکەوێت و مەنزڵەکان بێ وچان ببڕێت. عیماد ئەلدەولە دەستبەجێ بەرێکەوت. نزیك خۆرئاوا بوون بوو. عەمید هەمان ئێوارێ نامەکەی بەوەشمگیردا وئەو ڕێگەی نەدا سەرکردەکانی دیکە لەڕەی بڕۆنەدەر و فەرمان نامەی لەهەموو سەرکردەکان وەرگرتەوە. وەشمگیر ویستی کەسێك بەدوای

عیماد ئەلدەولە بنێرێت وبیگەڕێنێتەوە بەڵام عەمید پێی وت: ئەو خوازیارانە ناگەڕێتەوە و ئەگەری هەیە لەگەڵ نێردراوان بجەنگێت و سەرپێچی فەرمانەکان بکات. وەشمگیر چاوپۆشی لێکرد.

عیماد ئەلدەولە روویکردە کەرەج و چاکەکاری لەگەڵ خەڵکەکەی کردە پیشە و ڕێزی لەهەموان گرت. ئەوان نامەیان بۆ مەرداویج دەنووسی و سپاسی عیماد ئەلدەولەیان دەکرد و ئاماژەیان بەشیاوی ئەو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دەدا. عیماد ئەلدەولە دەستی بەسەر چەندین قەڵای خوڕەمییەکاندا گرت و گەنجینەی زۆری بەدەست هێنا و هەمووی بۆ نزیك کردنەوەی کەسەکان لەخۆی و بەهێز کردنی پەیوەندییەکان خەرج کرد. بەرادەیەکی بەخشی ناوبانگی لەهەموو شوێنەکان بڵاو بوویەوە و خەڵکان مەبەستی بینینی ئەویان دەکرد و هاوشێوەی کەسێکی ڕێزدار ناویان دەبرد.

مەرداویج لەو کاتەدا لەتەبەرستان بوو. کاتێك بۆ ڕەی گەڕایەوە، دیاری بەژمارەیەك لەسەرکردەکانی خۆی لەکەرەجدا. عیماد ئەلدەولەیش چاکەی لەگەڵ کرد و دیاری بەسەر هەمواندا بەخشییەوە.

مەرداویج لەم کارەی عیماد ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە و ترسی ئەوی کەوتە دڵ. لەناردنی ئەم سەرکردانە بۆ کەرەج پەشیمان بوویەوە. بۆ ئەم مەبەستە نامەیەکی بۆ عیماد ئەلدین و سەرکردەکانی دیکە نووسی و فەرمانی پێدان بۆ لای خۆی بگەڕێنەوە. عیماد ئەلدەولە لەڕۆشتن خۆی دوادەخست و پەیمانی لەسەرکردەکان وەرگرت و لەزاڵبوونی مەرداویج ئەوانی ترساند. هەموو سەرکردەکان پەیوەستی بوون. عیماد ئەلدەولە باجی کەرەجی کۆکردەوە. لەم کاتەدا شیرزاد یەکێك لەسوپاسالارەکانی دەیلەم داوای ئەمانی لەعیماد ئەلدەولە کرد و بەم شێوەیە عیماد ئەلدەولە دڵگەرم بوو. عیماد لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەکەرەجەوە بەرەو ئیسفەهان بەڕێکەوت کەموزەفەر کوڕی یاقوت لەگەڵ دەهەزار جەنگاوەر پارێزگارییان لەم شارە دەکرد و باوکی عەلی کوڕی ڕۆستەم باجی کۆدەکردەوە. عیماد ئەلدەولە کەسی بۆ لای ئەو دووانە نارد و داوای مۆڵەتی لێکردن تا پەیوەستیان ببێت و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی خەلیفە نیشان بدات و

بتوانێت بەم شێوە بگاتە دەرباری خەلیفە. ئەو دوانە وەڵامی داواکارییەکەی عیماد ئەلدەولەیان نەدایەوە. باوکی عەلی زیاتر لەموزەفەر خوازیاری دوورکەوتنەوە لەعیماد ئەلدەولە بوو. لەبەختی باشی عیماد، باوکی عەلی لەو ڕۆژانەدا مرد و کوڕی یاقوت سێ فەرسەخ لەئیسفەهان دوور بوو. لەناو سوپاکەی ئەو شەش کەس لەخەڵکانی گیلان و دەیلەم دەبینران. ئەم شەش کەسە کاتێك لەبەخششەکانی عیماد ئەلدەولە ئاگادار بوونەوە، داوای ئەمانیان لێکرد و بەمشێوەیە یاقوت ورەی لەدەستدا و عیمادە ئەلدەولە زیاتر پشتگەرم بوو. عیماد ئەلدەولە ڕووبەڕووی یاقوت بوویەوە و شەڕێکی مەترسیدار دەستی پێکرد. کوڕی یاقوت شکستی خوارد و عیماد ئەلدەولە دەستی بەسەر ئیسفەهاندا گرت. خەڵکان وەك کەسێکی ڕێزدار لەقەڵەمیان دەدا چوونکە توانیبووی لەگەڵ نۆسەد جەنگاوەر، دەهەزار شەرکەر تێکبشکێنێت. خەلیفە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و ئەو کارەکەی عیماد ئەلدەولەی بەگەورە زانی بەهەمان شێوە مەرداویجیش ئاگادار بوویەوە و پەرێشانی بەروخسارییەوە دەرکەوت. مەرداویج لەسنورەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەترسا.

## زاڵبوونی کوڕی بویە لەئەرجان[٢١] و کەنارەکانی دیکە و فەرمانڕەوایی مەرداویج لەئیسفەهان

کاتێك هەواڵی ئەم جەنگە بەرمەرداویج گەیشت، لەعیماد ئەلدەولە کوڕی بویە ترسا و ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر. نامەی بۆ نووسی، هەم گلەیی لێکرد و هەم داوای لێکرد ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشان بدات تا بۆ گرتنی سەرزەمینەکانی دیکە بەسوپاکەی هاوکاری بکات. تەنیا داواکاری مەرداویج ئەوەیە لەو شارانەی دەستی بەسەردا دەگرێت، بەناوی ئەو وتاری هەینی بخوێنێتەوە.

کاتێك مەرداویج پەیکی خۆی بۆ لای عیماد ئەلدەولە نارد، وەشمگیری برای لەگەڵ سوپایەکی گەورە ئامادە کرد تا عیماد ئەلدەولە کەبەنامەکەی دڵخۆش دەکات، بەشێوەیەکی لەناکاو سەرکوت بکات بەڵام عیماد ئەلدەولە ئەمەی زانی و دوای وەرگرتنی باجی دوو مانگ ئیسفەهانی بەجێهێشت و ڕووی کردە ئەرجان. ئەرجان لەژێر فەرمانی ئەبوبەکر کوڕی یاقوتدا بوو بەڵام ئەبوبەکر بێ جەنگ شارەکەی بەعیماد ئەلدەولە سپارد و خۆی بەرەو رامهورموز بەرێکەوت. بەم شێوەیە عیماد ئەلدەولە لەزیحەججە/ نۆڤەمبەر دەستی بەسەر ئەرجاندا گرت و کاتێك لەئیسفەهان هاتەدەر، وەشمیگر و سوپای براکەی ڕۆشتنە ناو شارەکە و کۆنترۆڵیان کرد. کاتێك قاهیر ئەم هەواڵەی بیست، پێش دەست لەکار کێشانەوەی خۆی پەیکی بۆ لای مەرداویج نارد تا ڕێگە نەدات براکەی دەست بەسەر ئیسفەهاندا بگرێت و شارەکە بەمحەممەد کوڕی یاقوت بسپێرێت. مەرداویج فەرمانەکەی ئەنجامدا و محەممەد فەرمانڕەوایەتی ئیسفەهانی گرتەدەست.

عیماد ئەلدەولە بەزاڵبوونی لەئەرجان، دارایەکی زۆری لەو شارە کۆکردەوە و بەهێز بوو. لەم کاتەدا نامەی باوکی تالیب زەید کوڕی عەلی نەوبەندجانی بەردەوام دەگەیشت و ئەوی بۆ لای خۆی بانگ دەکرد و پێشنیاری دەدا ڕێگەی

---

[٢١]– ئەرجان یا ئەرگان شارێکی کۆنی فارس بووە لەسەر ڕووباری تاب (ئاوی کوردستان) لەنزیك شاری بەهبەهان کەدەڵێن قوبادی ساسانی بۆ جێگیر کردنی زیندانییەکانی جەنگی ئامەد (دیاربەکر) و مەیافارقین دروستی کرد. وەرگێر.

شیراز بگرێتەبەر. هێزی یاقوت و سوپاکەی ئەوی بەکەم بایەخ لەقەڵەم دەدا و باسی بوێری و کۆکردنەوەی باج و دارایی فراوانی یاقوتی بۆ کرد و ئەوەی ئەمە ژیانی خەڵکانی دژوار کردووە و هەموان لێی دەترسن و بڵاوەیان لێکردووە. عیماد ئەلدەولە بەسوپا و سامانی خۆی لەرووبەروو بوونەوەی یاقوت دەترسا بەتایبەت ئەوەی ئەگەری بوو کوڕەکەی یاقوتیش بگات و هەردووکیان پێکەوە دەیانتوانی لەناوی ببەن. لەبەر ئەمە بەداواکەی باوکی تالیب رازی نەبوو و لەشوێنەکەی خۆی نەجووڵا. باوکی تالیب دووبارە نامەیەکی دیکەی بۆ نووسی و هانیدا و عیماد ئەلدەولەی ئاگادار کردەوە کەمەرداویج نامەیەکی بۆ یاقوت نووسیوە و پێشنیاری سازان و ئاشتی پێکردووە و ئەگەر ئەوان پەیمانی ئاشتی ببەستن، بۆ جەنگی ئەو یەکدەگرن و ئەو توانای رووبەروو بوونەوە لەگەڵ دوو دوژمنی نابێت. ئەو بۆ عیماد ئەلدەولەی نووسی باشترین ئەندێشەی کەسێك وەك ئەو ئەمەیە بۆ جەنگی ئەو کەسەی لێی نزیکە، پەلە بکات و چاوەڕوانی یەکگرتن و کۆبوونەوەی ئەوان نەکات کە لەهەر لاییکەوە گەمارۆی بخەنەسەر و چیتر نەتوانێت هەنگاوێك هەڵگرێت.

باوکی تالیب ئەوەندە نامەی بۆ عیماد ئەلدەولە نووسی کەسەرەئەنجام ئەو لەرەبیع الاخر/ مارسی ساڵی ٣٢١/ ٩٣٣ زایینی رێگەی نەوبەندجانی گرتەبەر بەڵام پێشتر سوپا دوو هەزار کەسییەکەی یاقوت خێراتر بەرێکەوتن. کاتێك عیماد ئەلدەولە گەیشت و رووبەرووی ئەوان بوویەوە، نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن و بەرەو گورگان هەڵاتن. لەم کاتەدا یاقوت و سوپاکەی گەیشتن. باوکی تالیب بەنوێنەرەکانی خۆی لەنەوبەند جان فەرمانیدا هاوکاری عیماد ئەلدەولە بن و نیازەکانی دابین بکەن. باوکی تالیب خۆی ڕۆشتە یەکێك لەگوندەکان تا هاوپەیمانی ئەو لەگەڵ عیماد ئەلدەولە بۆ کەس ئاشکرا نەبێت ئەو برە پارەی باوکی تالیب بۆ هاوکاری عیماد ئەلدەولە بەکاری برد، دووسەد هەزار دینار بوو.

عیماد ئەلدەولە، رۆکن ئەلدەولە حەسەنی برای بۆ کازەرون و کەنارەکانی دیکەی فارس نارد و ئەو لەم سەرزەمینانە سامانی زۆری کۆکردەوە. یاقوت سوپایەکی بۆ کازەرون ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە رووبەرووی رۆکن ئەلدەولە

بوویەوە بەڵام ڕۆکن ئەلدەولە و سوپا کەمەکەی هاوڕێی ئەم سوپایەی تێکشکاند و تەندروست و بێ زیان بۆ لای براکەی گەڕایەوە.

عیماد ئەلدەولە لەنامە گۆڕینەوەی نێوان مەرداویج و وەشمگیر بۆ یاقوت و نامەکانی یاقوت بۆ ئەو دوانە ئاگادار بوویەوە. لەیەك گرتنی ئەوان ترسا و لەبەر ئەمە لەنەوبەند جانەوە ڕێگەی ئیستەخری گرتەبەر و لەوێوە بەرەو بەیزا بەڕێکەوت. یاقوت بەردەوام شوێنپێی هەڵدەگرت. عیماد ئەلدەولە گەیشتە پردێك لەسەر ڕێگەی کرمان بەڵام یاقوت زووتر خۆی گەیاندە پردەکە و ڕێگەی نەدا عیماد ئەلدەولە لەپردەکە بپەڕێتەوە و بەم شێوەیە عیماد ئەلدەولە بەجەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە ناچار بوو. ئەم جەنگە لەکۆتایی ساڵی ٣٢١/٩٣٣ زایینی ڕوویدا و درێژەی کێشا بۆ ساڵی ٣٢٢/٩٣٤ زایینی.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا منداڵەکانی سەعلەبە لەگەڵ منداڵەکانی ئەسەد کۆبوونەوە و لەگەڵ هاوڕێکانی خۆیان لەهۆزی تەی مەبەستی سەرزەمینی موسڵیان کرد و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی منداڵەکانی مالیك و هاوڕێکانی ئەوان لەمنداڵەکانی تەغلەب یەکیانگرت. ئەم دوو دەستەیە بۆ جەنگ لەیەك نزیك بوونەوە. ناسر ئەلدەولە حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدان لەگەڵ بنەماڵە و پیاوەکانی خۆی بەهاوڕێیەتی باوکی ئەغور کوڕی سەعید کوڕی حەمدان بۆ سەقامیگر کردنی ئاشتی لەنێوان ئەم دوو دەستەیە بەڕێکەوتن. باوکی ئەغور سەرقاڵی قسە کردن بوو کەیەکێك لەمنداڵەکانی سەعلەبە بریندار کرد و کوشتی. ناسر ئەلدەولە و هاوڕێکانی هێرشیان کردنەسەر و شکستیان پێ هێنان و دەستەیەك لەوانیان کوشت و ماڵ و بنەماڵە و سامانی ئەوانیان تاڵان کرد. دەستەیەکیان سوار ئەسپ بوون و لەگۆڕەپانی جەنگ هەڵاتن. ناسر ئەلدەولە تا حەدیسە شوێنیان کەوت. کاتێك ئەوان گەیشتنە حەدیسە، یەئنس، کۆیلەی مونس، کەفەرمانڕەوایەتی موسڵی دەکرد، چاوی پێیان کەوت و منداڵەکانی سەعلەبە و منداڵەکانی ئەسەد، پەیوەستی یەئنس بوون و بۆ دیاری ڕەبیعە گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا هەواڵ گەیشتە بەغداد کەتەکین، فەرمانڕەوای میسر، کۆچی دوای کرد.

دوای ئەوەی تەکین مرد، محەممەدی کوڕی لەسەر تەخت دانیشت. قاهیر خەڵاتی بۆ نارد. لەم کاتەدا سوپای میسر شۆڕشی کرد. محەممەد رووبەروویان بوویەوە و شکستی پێهێنان.

لەم ساڵەدا کوڕی بولەیق، پێش ئەوەی گرفتار ببێت، فەرمانی بەدەبیرەکەی حەسەن کوڕی هاروندا معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و یەزیدی کوڕی لەسەر مینبەرەکان نفرین بکەن. خەڵکان سەرگەردان بوون. عەلی کوڕی بولەیق بڕیاریدا بەربەهاری پێشەوای حەنبەلییەکان و هاوەڵانی ئەو قۆڵبەست بکات چوونکە ئاگری ئەم ئاژاوەیان خۆش دەکرد بەڵام بەربەهاری ئاگادار بوویەوە و هەڵات. دەستەیەك لەهاوەڵە نزیکەکانی ئەویان گرت و زیندانیان کردن. دواتر سوار بەلەم و بەرەو عومان ڕەوانەیان کردن.

لەم ساڵەدا قاهیری خەلیفە فەرمانیدا مەی و گۆرانی خوێندن و هەموو شلەمەنییە سەرخۆشکەرەکان بەناڕەوا لەقەڵەم بدەن و دەستەیەك لەوانەی بەهۆی ئەم کارانەوە ناوبانگی خراپەکارییان دەرکردبوو، بۆ بەسرە و کوفە دوور خستەوە. فەرمانی فرۆشتنی کەنیزە سادە گۆرانیبێژەکانی دەرکرد. دواتر دەستەیەکی راسپارد تا ئەو کەسانەی شارەزای گۆرانی خوێندن بوون، بکڕنەوە و خۆی، ئەو کەنیزانەی دەیویست، بەبەهای هەرزان کڕییەوە. قاهیر لەتامەزرۆیی بۆ گۆرانی خوێندن بەناوبانگ بوو. ئەم فەرمانەی کردە بیانوێك تا بەهەرزانترین نرخ بەخواستەکەی خۆی بگات. پەنا دەبەین بەر خوا بۆ خۆ دوور خستنەوەی لەو کردارانەی خەڵکی سەرشەقامەکانیش ئەنجامی نادەن.

لەم ساڵەدا لەمانگی شەعبان/ جولای ئەبوبەکر محەممەد کوڕی حەسەن کوڕی دوریدی لوغەوی و باوکی هاشم کوڕی باوکی عەلی جەبائی، وتارخوێنی موعتەزیلە، هەردووکیان لەیەك رۆژ مردن و لەگۆڕستانی خەیزەران بەخاك سپێردران.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یوسف کوڕی مەتەری فەربەری کە لەساڵی ٨٤٥/٢٣١ زاییینی چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو و صحیحی بوخارییان لەو گێڕاوەتەوە، مرد. ئەو دەیان هەزار حەدیسی لەبوخاری بیستبوو و ئەم حەدیسانە تەنیا لەسەردەست و زمانی خۆی بڵاو کرایەوە. ئەو بۆ فەربەر لەگوندەکانی بوخارا دەگەڕێتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و دووی کۆچ ( ٩٣٤ زایینی )

## زاڵبوونی عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە لەشیراز

لەم ساڵەدا عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە سەرکەوتنی بەسەر یاقوت بەدەست هێنا و شیرازی خستە ژێر فەرمانی خۆی. پێشتر باسی گەیشتنی عیماد ئەلدەولە بەپردەکە و پێشکەوتنی یاقوتمان کرد. کاتێك عیماد ئەلدەولە گەیشتە پردەکە و یاقوت ڕێگەی پەڕینەوەی لێگرت، بەناچاری بۆ جەنگی یاقوت خۆی ئامادە و لەجومادی الاخرە// مەی ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. کوڕی بویە هاوەڵانی کۆکردەوە و بەڵێنی پێدان خۆی شان بەشانی ئەوان شمشێر دەوەشێنێت. هەروەها مژدەی چاکەکاری و پاداشتی بەواندا.

لەخۆشبەختی عیماد ئەلدەولە ئەوە بوو دەستەیەك لەهاوەڵانی داوای ئەمانیان لەیاقوت کرد و کاتێك یاقوت ئەوانی بینی، فەرمانیدا سەریان ببڕن. هاوەڵانی کوڕی بویە دڵنیابوون لەوەی یاقوت ئەمانیان پێ نابەخشێت و لەبەر ئەمە بەهەموو هێزیانەوە شمشێریان وەشاند.

لەم کاتدا یاقوت پیادەو نەوت پرژێنەکانی خۆی پێشخست بەڵام بایەکی سەخت هەڵیکرد و ئاگر ڕووبەڕووی خۆیان بوویەوە. کاتێك ئەمەیان بینی، نەوت پرژێنەکانیان فڕێدا و بەم شێوەیە خۆیان گڕیان تێ بەربوو. شڵەژان کەوتە سوپاکەی یاقوت و هاوەڵانی عیماد ئەلدەولە هێرشیان کردنەسەر و ژمارەیەکی زۆر لەپیادەکانیان کوشت و ڕووبەڕووی سوارەکان بوونەوە. سوارەکان هەڵاتن و بەم شێوەیە بەڵایەکی قورس و گران بەسەر سوپاکەی یاقوتدا هات.

کاتێك یاقوت شکستی خوارد، پەنای بۆ تەپۆڵکەیەکی بەرز برد و فەرمانی گەڕانەوەی بەسوپاکەیدا. نزیکەی چوار هەزار سوپایی لەدەروی کۆبوونەوە. ئەو بەهاوەڵانی خۆی وت: خۆڕاگربن چوونکە دەیلەمییەکان سەرقاڵی کۆکردنەوەی تاڵانیین و ئێوە دەتوانن دیلیان بکەن. ئەوان لەگەڵ یاقوت خۆڕاگرییان کرد. کاتێك عیماد ئەلدەولە خۆڕاگری ئەوانی بینی، ڕێگەی نەدا سوپاکەی بەکۆکردنەوەی تاڵانییەکان سەرقاڵ بن و وتی: دوژمن چاوەڕوانە ئێوە بەکۆکردنەوەی تاڵانییەکان

سەرقاڵ بن تا هێرشتان بکاتەسەر ولەناوتان ببات. کەواتە گرنگی بەتاڵانییەکان مەدەن و کاتێك لەتێکشکانی یەکجارەکی ئەوان ئاسوودە بوون، تاڵانییەکان کۆبکەنەوە. فەرمانەکەی جێبەجێ کرا. کاتێك یاقوت بینی سوپاکەی عیماد ئەلدەولە دەیانەوێت هێرش بکەن، رێگەی هەڵاتنی گرتەبەر و سوپای عیماد ئەلدەولە شوێنیان کەوتن و لەرێگە هەرکەسیان گرت، کوشتیان و ژمارەیەکیان ئەسیر کرد و چوارپێ و کەرەستەی جەنگی زۆریان وەك تاڵانی دەستکەوت.

لەو رۆژەدا مۆعێزئەلدەولە باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی بویە کەهێشتا موو لەروخساری نەهاتبوو و ساڵەکانی تەمەنی لەنۆزدە بەهار تێپەڕی نەدەکرد، زیاتر لەهەموان خۆڕاگری لەخۆی نیشاندا. ئەوان بۆ دەوروبەری شارەکە گەڕانەوە ودوای ئەوەی تاڵانی زۆریان کۆکردەوە، ئەو کڵاوانەیان بینی کەکلکی رێوی پێوە چنرا بوو. زنجیری زۆریان بینی و کاتێك لەهاوەڵانی یاقوت سەبارەت بەوانە پرسیاریان کرد، وتیان: ئەمانەمان ئامادە کردبوو تا لەئەگەری سەرکەوتن بەسەر ئێوەدا، کڵاوەکانتان بکەینەسەر و لەناو شاردا بتانگێڕین. هاوەڵانی عیماد ئەلدەولە پێشنیاریان کرد ئەم بەڵایە بەسەر هاوەڵانی یاقوتدا بێنن بەڵام عیماد ئەلدەولە مۆڵەتی نەدا و وتی: ئەم کارە لەکاتی سەرکەوتن خراپەکارییە و ریسواییە. یاقوت بەسزای خۆی گەیشت.

عیماد ئەلدەولە بەشێوەیەکی چاك مامڵەی لەگەڵ دیلەکان دەکرد، هەموانی رزگار کرد و وتی: ئەم سەرکەوتنە نیعمەتە و سپاس کردنی پێویستە بۆ ئەوەی فراوانتر بێت. ئەو ئەسیرەکانی ئازاد کرد لەوەی ئەگەر دەخوازن لای ئەو بمێننەوە یا بۆ ناو سوپاکەی یاقوت بگەڕێنەوە. هەموو دیلەکان مانەوە لەناو ریزی سوپاکەی ئەویان هەڵبژارد. عیماد ئەلدەولە دیاری پێشکەش کردن و وەك سەروەرێکی چاکەکار لەگەڵیان هەڵس و کەوتی کرد.

عیماد ئەلدەولە ئەو گۆڕەپانەی بەجێهێشت و لەشیراز ئوردووی لێدا و جاڕی ئەمانی لەناو خەڵکان بەرز کردەوە و دادپەروەری کردە پیشە. پاسەوانەکانی دانا بۆ ئەوەی کەس ستەمی لێ نەکرێت. عیماد ئەلدەولە دەستی بەسەر ئەم سەرزەمینەدا گرت. لەم کاتەدا سوپا داوای رۆژانەی خۆی کرد بەڵام ئەو سامانی

نەبوو. ئەوەندەی نەمابوو بارودۆخی بشلەژێت. عیماد ئەلدەولە لەژوورەکەی خۆی لەکۆشکی ئەمیر دانیشتبوو وبیری لەبارودۆخی خۆی دەکردەوە کە لەناکاو مارێکی لەناو سەقفەکەدا بینی کە لەکونێکەوە بۆ کونێکی دیکە ڕۆشت. ترسا لەوەی مارەکە بەسەر ئەودا بکەوێتەخوار. چەند کەسێکی بانگ کرد و کونی مارەکەیان گەورە کرد. لەولای کونەکە دەرگایەکیان بینی. ئەو دەرگایە بەژوورێك کۆتایی دەهات. لەناکاو چاویان بەدە سنووقی پڕ لەزێڕ و دروستکراوەکان لەزێڕ کەوت کەبەهای گشتی هەمووی دەگەیشتە پێنسەد هەزار دینار. عیماد ئەلدەولە ئەم سامانەی بۆ سوپاکەی خەرج کرد و بەم شێوەیە جارێکی دیکە فەرمانڕەوایەتییەکەی بەهێز بوو.

دەگێڕنەوە عیماد ئەلدەولە دەیویست دەستێك جل بۆ خۆی بدوورێت. خەیاتێکیان ناوبرد کەجل و بەرگی بۆ کوڕی یاقوت دەدوری. عیماد ئەلدەولە ئەوی بانگ کرد. خەیات کەڕ بوو، بەترس و لەرزەوە هات. عیماد ئەلدەولە پێی وت: مەترسە، تۆم بانگ کردووە تا دەستێکم جلم بۆ بدووریت. خەیات کەدەنگی عیماد ئەلدەولەی نەدەناسی دەستی بەسوێند خواردن کرد و وتی ژنەکەم پێم حەرام بێت و لەئیسلام بەدوور بم ئەگەر سنووقەکانی یاقوتم کردبێتەوە. عیماد ئەلدەولە سەریسورما و فەرمانیدا سنووقەکان بێنن. هەشت سنووقیان هێنا کەبەهای سامانەکان و جل و بەرگەکانی ناوی دەگەیشتە سێسەد هەزار دینار. لێرەوە بوو سامانە فراوانەکەی یاقوت و گەنجینەکانی یەعقوب و عەمرۆ، دوو کورەکەی لەیس ئاشکرا بوو. بەم شێوەیە گەنجینەی عیماد ئەلدەولە پڕ و فەرمانڕەوایەتییەکەی بەهێز بوو.

کاتێك عیماد ئەلدەولە دەستی بەسەر فارس و شیرازدا گرت، نامەیەکی بۆ خەلیفەی ئەو سەردەمە، رازی باللە نووسی کەئاماژەی پێدەدرێت. هەروەها نامەیەکی بۆ وەزیرەکەی باوکی عەلی کوڕی موقلە نووسی و ئەو دوانەی ئاگادار کردەوە کەملکەچی فەرمانەکانی ئەوانە و داوای کرد لەبەرابەر فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینەکانی ژێر دەستی ساڵانە یەك هەزار هەزار درهەمماڵیات ڕەوانەی بەغداد بکات. دەرباری خەلیفە بەداواکارییەکەی رازی و خەلات و ئالای

فەرمانڕەوایەتی بۆ نارد. بەنێردراویان وتبوو پێش وەرگرتنی پارەکە خەڵات و ئاڵای فەرمانڕەوایەتی پێنەدات.

کاتێك نێردراو گەیشتە شیراز، عیماد ئەلدەولە بۆ پێشوازی کردنی هات و داوای خەڵات و ئاڵای فەرمانڕەوایەتی لێکرد. نێردراو لەمەبەستی دەربار ئاگاداری کردەوە. عیماد ئەلدەولە خەڵات و ئاڵاکەی بەزۆر وەرگرت، جلەکانی پۆشی و ئاڵاکەی لەبەردەم خۆی هەڵکرد و ڕۆشتە ناو شارەکە. ئەو نێردراوەکەی بەپارە فریودا و نێردراو لەساڵی ٩٣٥/٣٢٣ زایینی مرد و پێگەی عیماد ئەلدەولە بەرز بوویەوە و خەڵکان لەهەموو کەنارەکانەوە پەیوەستی دەبوون.

کاتێك مەرداویج لەمە ئاگادار بوویەوە، کەوتە جموجۆڵ و ڕوویکردە ئیسفەهان بۆ ئەوەی بیر لەڕێگە چارەیەك بکاتەوە. براکەی مەرداویج، وەشمگیر، فەرمانڕەوایەتی ئیسفەهانی دەکرد چوونکە لەکاتی لابردنی قاهیر و کشانەوەی محەممەد کوڕی یاقوت لەئیسفەهان، ئەم شارە بۆ ماوەی نۆزدە ڕۆژ بێ فەرمانڕەوا بوو. لەبەر ئەمە وەشمگیر بۆ شارەکە گەڕابوویەوە. کاتێك مەرداویج گەیشتە ئیسفەهان، وەشمگیری برای بەرەو ڕەی ڕەوانە کرد.

## سەرکەوتنی نەسر کوڕی ئەحمەد لەکرمان

لەم ساڵەدا باوکی عەلی محەممەد کوڕی ئەلیاس لەکرمانەوە بەرەو سەرزەمینی فارس بەڕێکەوت و گەیشتە ئیستەخر. ئەو بەمەبەستی فریودان وای نیشاندا دەخوازێت ئەمان لەیاقوت وەربگرێت بەڵام یاقوت هەستی بەفێڵەکەی کرد و کوڕی ئەلیاس بەناچاری بۆ کرمان گەڕایەوە. سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای خوراسان، ماکان کوڕی کالی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی کوڕی ئەلیاس ڕەوانە کرد و کوڕی ئەلیاس شکستی خوارد و ماکان بەنوێنەرایەتی فەرمانڕەوای خوراسان، دەستی بەسەر کرماندا گرت.

محەممەد کوڕی ئەلیاس یەکێك بوو لەهاوەڵانی نەسر کوڕی ئەحمەد کەنەسر لێی توڕە و زیندانی کرد. دواتر محەممەد کوڕی عوبەیداللەی بەلغەمی بوو بەنێوەنجیگەر و لەزیندان ئازادی کرد. نەسر کوڕی ئەحمەد ئەوی لەگەڵ محەممەد

کوڕی موزەفەر بۆ جورجان نارد. کاتێك – وەك ئاماژەی پێدرا– یەحیا کوڕی ئەحمەد و براکانی لەبوخارا ئالآ شۆڕشیان بەرز کردەوە، محەممەد کوڕی ئەلیاس پەیوەستی بوو و کاتێك یەحیا شکستی خوارد، محەممەد لەنەیشابورەوە بەرەو کرمان ڕۆشت و تا ئەم زەمانە فەرمانڕەوایەتی کرمانی دەکرد تا ئەوەی ماکان کوڕی کالی ئەوی لەو شارە دەرپەڕاند. محەممەد ڕێگەی دینەوەری گرتەبەر و ماکان لەکرمان مایەوە و کاتێك – ئاماژەی پێدەدرێت– لەکرمان گەڕایەوە، محەممەد کوڕی ئەلیاس جارێکی دیکە بەرەو ئەو شارە گەڕایەوە.

## لابردنی قاهیر باللە لەخەلافەت

لەجومادی الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە قاهیر باللە لەخەلافەت دوورخرایەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: باوکی عەلی کوڕی موقلە و حەسەن کوڕی هارون خۆیان لەقاهیر دەشاردەوە و قاهیر بەدوای ئەواندا دەگەڕا. ئەم دوانە لەگەڵ سەرکردەکانی ساجییە و حەجەرییە نامەیان ئاڵ و گۆڕ کرد و سەرکردەکانیان لەخراپەکاری قاهیر ئاگادار کردەوە و فرت و فێڵ و پەیمان شکێنییەکانی قاهیریان بیرخستنەوە. باسی کوژرانی مونس، بولەیق و عەلی کوڕی بولەیقیان بەدەستی قاهیر کرد و لەگرفتاری بوونی تەریفی سوبکەری دوای سوێند خواردنی قاهیر دوان لەکاتێکدا تەریف چاکەخواز و خێرخوازی قاهیر بوو.

کوڕی موقلە جارێکیان شەوانە و جارێکیان بەجل و بەرگی کوێرەکان و جارێك بەجل و بەرگی سواڵکەران و جارێك بەجل و بەرگی ژنان دەڕۆشتە لای سەرکردەکان و ئەوانی دژی قاهیر هان دەدا.

کوڕی موقلە دووسەد دینار و حەسەن سەد دیناری بەئەستێرەناسەکەی سیما دا تا پێی بڵێت لەئەستێرەکەی ئەودا دەبینێت سەرئەنجام قاهیر دەیکوژێت و خوێنی دەرێژێت. لەلایەکی دیکە کوڕی موقلە پارەی بەو کەسەدا کەخەوەکانی سیمای لێکدەدایەوە تا ئەو لەقاهیر بترسێنێت و خەوەکان بەو شێوەی کوڕی موقلە دەخوازێت، لێك بداتەوە و بەم شێوەیە سیما زیاتر لەجاران لەقاهیر دەترسا.

لەم کاتەدا قاهیر سیاچاڵێکی لەناو کۆشکەکەی خۆی هەڵکەند. بەسیما و

دەستەیەك لەسەرکردەکانی ساجییە و حەجەرییە وترا قاهیر ئەم سیاچالانە لەترسی ئێوە هەڵدەکەنێت. بەم شێوەیە سەرکردەکان زیاتر رق و کینەی قاهیریان لەدڵ گرت. بەسیمایان وت قاهیر مەبەستی کوشتنی تۆی هەیە. سیما سەرکردەکانی ساجییە کۆکردەوە - خۆی رێبەری ئەوان بوو- و کەرەستەی جەنگی پێدان و پەیامی بۆ سەرکردەکانی حەجەرییە نارد ئەگەر هاوپەیمانی ئێمەن، وەرن بۆ لای ئێمە تا پەیمان ببەستین. سەرکردەکانی حەجەرییە هەموویان هاتن و بۆ یەك هەڵوێستی و یەکدەنگی بڕیاریاندا و سوێندیان خوارد هەرکەس لەوان رێگەی ناسازگاری بگرێتەبەر، خوێنی دەڕێژن.

قاهیر و خوسەیبی لەم یەك هەڵوێستییە ئاگادار بوونەوە. وەزیر نوێنەرێکی بۆ لای ئەوان نارد و پرسی: چ هۆکارێك بۆ ئەم هەڵوێستە ناچاری کردوون؟ وتیان: هەواڵێکی راستمان بەدەست گەیشتووە کەقاهیر مەبەستی کوشتنی سیمای لەسەردایە و چەندین سیاچاڵی دروست کردووە تا سەرکردە و رێبەرەکانی ئێمەی تیا زیندانی بکات. لەرۆژی چوارشەممە، شەشی جومادی الاوەل/ بیست و پێنجی ئاوریل، سوپای ساجییە و حەجەرییە کۆبوونەوە و بڕیاریاندا قاهیر بگرن. سیما پێی وتن: هەنووکە هەستن تا مەبەستەکەی خۆمان بەئەنجام بگەیێنین چوونکە ئەگەر کەمتەرخەمی بکەین، قاهیر لەمەبەستەکەی ئێمە ئاگادار دەبێتەوە و خۆی دەپارێزێت و ئێمە کوشتار دەکات.

وەزیر لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و سەلامەی پەردەدار و عیسای پزیشکی بۆ لای قاهیر نارد تا لەم هەواڵە ئاگاداری بکەنەوە. ئەم دوانە قاهیریان بەمەست و خەوتوو بینی و نەیانتوانی بەئاگایی بێننەوە و هەواڵەکەی پێ بڵێن.

سوپای حەجەرییە و ساجییە رژانە ناو کۆشك. سیما پاسەوانی بۆ دەرگاکان دانا تا کەس هاموشۆ نەکات. خۆی لای دەرگای سەرەکی وەستا و ئەوانی دی لەدەرگاکانەوە هێرشیان برد. قاهیری سەرخۆش بەدەنگە دەنگەکە بەئاگا هاتەوە و بەدوای دەرگایەك بۆ هەڵاتن دەگەڕا بەڵام پێیان وت بەردەم هەموو دەرگاکان بەپاسەوانەکان تەنراوە. ئەو بۆ سەقفی حەمامەکە هەڵات و کاتێك سەربازەکان ڕۆشتنە ژوورەکەی، ئەویان نەبینی. خزمەتکارەکانیان گرت و پرسیاری قاهیریان

لێکردن. خزمەتکارێکی کەم تەمەن شوێنی قاهیری نیشاندا و ئەوان بۆ گرتنی بەرێکەوتن. بینیان شمشێری بەدەستەوە گرتووە. هەرچەند هەوڵیاندا نەهاتەخوار. بەزمانێکی نەرم لەگەڵی دوان و وتیان: ئێمە بەندەی تۆین و تەنیا هاتووین پەیمانت لێ وەربگرین. قاهیر باوەڕی نەکرد و وتی: هەرکەس بۆ گرتنی من بێت، خوێنی دەڕێژم. یەکێك لەسەربازەکان کەوانێکی هەڵگرت و بەقاهیری وت: ئەگەر هاتیتەخوار چ باشتر وەگەرنە تیرێك لەقورگت دەچەقێنم. لەم کاتەدا قاهیر هاتەخوار و سەربازەکان گرتیان و بردیانە لای تەریفی سوبکەری. دەرگای زیندانیان کردەوە و تەریف هاتەدەر و قاهیریان لەجێگەی ئەو زیندانی کرد. هەردوو چاوی قاهیریان کوێر کرد. خوسەیبی وەزیر و سەلامەی پەردەدار هەڵاتن.

لەچۆنیەتی لابردنی قاهیر و یاخی بوونی سوپای ساجییە و حەجەرییە ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکەیش داوە: کاتێك قاهیر لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، کەم کەم لەپێگەی ساجییە و حەجەرییەی کەم کردەوە و نیازی گەورەکانی ئەوانی دابین نەدەکرد و ئەوانی بۆ کێشك گرتنی کۆشك رادەسپارد و مانگانەی ئەوانەی لەکاتی خۆیدا نەدەدا و ئەگەر کەسێك لەمبارەوە لەگەڵی دەئاخاوت بەشێوەیەکی توند وەڵامی دەدایەوە و گوێی لەقسەی بێژەرەکە نەدەگرت. ئەم دوو سوپایە یەکتریان لەمەترسییەکانی قاهیر ئاگادار کردەوە و سکاڵایان کرد. قاهیر بەسەلامە، پەردەدارەکەی خۆی وت: ئەی سەلامە، تۆ گەنجینەیەکیت و لەبەردەم من بەرێگەدا دەڕۆیت، چی دەبێت ئەگەر هەزار دینار بەمن بدەیت. سەلامە ئەم وتەی وەك گاڵتە لەقەڵەمدا.

خوسەیبی وەزیری قاهیر لەکردەوەکانی ئەو دەترسا. قاهیر نزیکەی پەنجا سیاچاڵی لەکۆشکەکەی خۆی هەڵکەند و دەرگای بەهێزی بۆ هەرکامیان دانا. دەوترا: ئەم سیاچاڵانەی بۆ سەرکردەکانی ساجییە و حەجەرییە هەڵکەندووە و بەم شێوەیە ترسی ئەو دوو سوپایە و سەرکردەکانی زیادی کرد. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا دەستەیەك لەقەرەمتییەکانیان لەفارس گرت و ڕەوانەی بەغدادیان کردن و هەموویان لەم سیاچاڵانەدا زیندانی کران. ئەوسا بەشێوەیەکی نهێنی فەرمان درا دەرگای سیاچاڵەکانیان بۆ بکەنەوە و چاکەیان لەگەڵ بکەن. قاهیر

دەیویست بەهاوکاری ئەم دەستەیە، خۆی بۆ گرتنی سەرکردەکانی ساجییە و حەجەرییە و کۆیلەکانی خۆی کەهاورێیەتی ئەوانیان دەکرد، بەهێز بکات.

سەربازەکانی ساجییە و حەجەرییە بارودۆخی قەرەمتییەکان و ئەوەی بوونەتە هاونشینی شەوانەی قاهیر، پەسەند نەدەکرد و وتەکانی خۆیان بەخوسەیبی و سەلامەی پەردەدار گەیاند و ئەوانیش، قاهیریان لەمەبەستی دوو سوپا ئاگادار کردەوە. قاهیر، قەرەمتییەکانی لەکۆشك دەرکرد و ئەوانی بەمحەممەد کوڕی یاقوت، فەرماندەی پاسەوانەکان سپارد. محەممەد ئەوانی لەناو چەندین ماڵ جێگە کردەوە و رێزی گرتن و هەرکەسی دەویست، دەیبردە لای ئەوان. بەم شێوەیە پێگەی سوپای ساجییە و حەجەرییە زیاتر دابەزی.

دوای ئەمە قاهیر لەدانیشتنەکانی خۆی ئەوانی سەرکۆنە دەکرد وبێزاری خۆی لەوان دەردەبڕی تا ئەو جێگەی سوپای ساجییە و حەجەرییە ئەمەیان بەئاشکرا لەروخسار و کردەوەکانی قاهیردا دەبینی. لەم کاتەدا سوپای ساجییە و حەجەرییە وایان نیشاندا یەکێك لەسەرکردەکانی ئەم سوپایە زاوایەتی خۆی کردۆتە جەژن. بەبیانوی زەماوەندی ئەو، کۆبوونەوە و ئەوەی دەیانویست ئەنجامیاندا و لێك جیابوونەوە. ئەویان پەیکیان بۆ لای شاپوری خزمەتکاری دایکی موقتەدر نارد و وتیان: تۆ دەزانی قاهیر چ بەڵایەکی بەسەردا هێنایت و تۆ بۆ هاوکاری قاهیر، دەستت بۆ هەر خراپەکارییەك درێژ کرد بەڵام ئەگەر ببیتە هاورێی ئێمە و فەرمان بەخزمەتکارەکان بدەیت قاهیر بگرن، خواوەند لەکردەوەکانی رابردووی تۆ چاوپۆشی دەکات وەگەرنە ئێمە کاری خۆمان لەتۆوە دەست پێدەکەین. ئەو ترس و بێزاری خۆی لەقاهیر بەوان راگەیاند و ئاگاداری کردنەوە کەهاوکارییان دەکات. وەك ئامارژەمان پێدا کوڕی موقلە دژی قاهیر پیلانی دەگێڕا و قسە و بوختانی هەڵبەست تا سەرئەنجام قاهیر لەسەر کار لابرا. خەلافەتی قاهیر ساڵێك و شەش مانگ و هەشت رۆژ درێژەی کێشا.

## خەلافەتی رازی اللە

ئەو هەمان باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی موقتەدر باللە یە. کاتێك قاهیریان گرت و زیندانییان کرد، لەخزمەتکارەکان پرسیاری شوێنێکیان کرد کەباوکی عەباس کوڕی موقتەدر لەوێ خۆی حەشاردابوو. خزمەتکارەکان شوێنی ئەویان نیشاندا. ئەو و دایکی لەزینداندا ژیانیان بەسەر دەبرد. سەربازەکان ڕۆشتن و دەرگای زیندانیان بۆ باوکی عەباس کردەوە و لەرۆژی چوارشەممە شەشی جومادی الاوەل/ بیست و پێنجی ئاوریل ئەویان هێنایە سەرتەخت و نازناوی رازی اللە یان پێبەخشی. سەرکردە و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەو عەلی کوڕی عیسا و براکەی عەبدولرەحمانی بانگ کرد و کارەکانی خۆی بەراوێژ کردن بەو دووانە ئەنجام دەدا. رازی باللە دەیویست عەلی کوڕی عیسا وەك وەزیر دەستنیشان بکات بەڵام ئەو لەبەر پیری و ناتەوانی بەم کارە رازی نەبوو و بۆ وەزارەت، پێشنیاری کوڕی موقلەی کرد.

لەم کاتەدا سیما بەرازی وت: رۆژگار لەگەڵ عەلی کوڕی عیسا سازگار نییە و کوڕی موقلە بۆ ئەم رۆژگارە شیاوترە. رازی ئەمان نامەیەکی بۆ کوڕی موقلە نووسی و ئەوی وەك وەزیر هەڵبژارد. کاتێك کوڕی موقلە وەزارەتی گرتەدەست، هەرکەس پێشتر خراپەی لەگەڵ کردبوو، بەشێوەیەك چاك مامڵەی لەگەڵ کرد و هەڵس و کەوتێکی پەسەند کراوی گرتەبەر. دەیوت: کاتێك خۆم شاردبوویەوە، ئەم پەیمانم لەگەڵ خواوەند بەست و پەیمانەکەی هێنایەدی. کوڕی موقلە شایەت و قازییەکانی کۆکردەوە و ئەوانی بۆ لای قاهیر نارد تا بۆ لەسەر کار لابرانی ئەو ببنە شایەت بەڵام قاهیر بەدەست لەکار کێشانەوە رازی نەبوو. هەمان شەو هەردوو چاویان دەرهێنا و بەم شێوەی سۆمای چاوەکانی لەدەستدا.

کوڕی موقلە بۆ خوسەیبی و عیسای پزیشك ئەمان نامەی نارد. هەردووکیان لەشوێنەکانی خۆیان هاتنەدەر. کوڕی موقلە رێزی لەهەر دووکیان گرت و چەند کارێکی بەخوسەیبی سپارد. رازی باللە بەدری خەرشەنی وەك فەرماندەی پاسەوانەکان هەڵبژارد و کوڕی موقلەی لەجومادی الاوەل/ ئاوریل باوکی فەزڵ کوڕی جەعفەر کوڕی فوراتی وەك نوێنەری خۆی لەسەر کارگوزارەکانی موسڵ،

قەردی، بازەبدی، ماریدن، توری عەبدین، دیاری جەزیرە، دیاربەکر، ڕێگەی فورات، سنورەکانی جەزایر و شام، کەنارەکانی شام و میسر دیاریکرد. باوکی فەزڵ لەوەرگرتنی باج، خواردەمەنی، خەرجییەکان و بەرید، هەرکەسی دەویست، لای دەبرد و هەرکەسی دەویست، دەیهێنایە سەرکار. ئەو کەسی بەدوای محەممەد کوڕی رائیق نارد و پێشنیاری پێکرد ببێتە پەردەداری خەلیفە. محەممەد کوڕی رائیق دەستی بەسەر ئەهواز وکەنارەکانی ئەو سەرزەمینە گرتبوو و کوڕی یاقوتی لەوێ دەرپەڕاندبوو. جگە لەشوش و جوندیشپاور هیچ شوێنێك لەژێر فەرمانی کوڕی یاقوتدا نەمابوو. وەك ئاماژەمان پێدا کوڕی یاقوت دەیویست ببێتە فەرمانڕەوای ئیسفەهان. ئەمە لەدوایین ڕۆژەکانی خەلافەتی قاهیردا ڕوویدا. کاتێك رازی هاتە سەرکار و کوڕی یاقوتی بانگ کرد، ئەو ڕێگەی واستی گرتەبەر و محەممەد کوڕی یاقوت داوای کرد خۆی ببێتە پەردەدار و خەلیفە بەداواکەی رازی بوو. محەممەد کوڕی یاقوت بەدوای کوڕی رائیق بەرێکەوت. کوڕی رائیق ئاگادار بوویەوە و بێ درەنگ واستی بەجێهێشت و هەوڵیدا زووتر لەکوڕی یاقوت بگاتە بەغداد. کاتێك گەیشتە مەدائین، نامەی رازی بەدەست گەیشت کەفەرمانی پێدا بوو نەیێتە ناو بەغداد و فەرماندەیی کاروباری جەنگی واستی پێ سپاردبوو لەگەڵ ئەوەی فەرمانڕەوایەتی بەسرە و ناوچەکانی دەوروبەری لەژێر فەرمانی ئەودا هێشتەوە. کوڕی رائیق لەڕێگەی دیجلەوە گەڕایەوە و کوڕی یاقوت لەهەمان ڕێگەوە هات. بەم شێوەیە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سڵاویان بۆ یەکتر نارد و کوڕی یاقوت هاتە بەغداد و بوو بەپەردەداری خەلیفە و چۆنیەتییەکەی ئاماژەی پێدەدرێت.

## مەرگی مەهدی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە و فەرمانڕەوایی کوڕەکەی، قائیم

لەرەبیع الاوەل/ فەوریەی ئەم ساڵە مەهدی باوکی محەممەد عوبەیداللەی عەلەوی لەمەهدییە مرد و باوکی قاسمی کوڕی یەك ساڵ مەرگی ئەوی لەخەڵکان شاردەوە تا بەمەبەستەکانی خۆی بگات، چوونکە لەوە دەترسا ئەگەر خەڵکان لەمەرگی مەهدی ئاگادار ببنەوە، سەبارەت بەفەرمانڕەوایەتی ئەو سازگار و هاودەنگ نەبن. مەهدی لەکاتی مەرگ شەست و سێ ساڵە بوو. فەرمانڕەوایەتی ئەو لەو کاتەوەی ڕۆشتە ناو رەقادە و لەرۆژی خوێندنەوەی وتار بەناوی ئەو، بیست و چوار ساڵ و یەك مانگ و بیست و یەك رۆژ درێژەی کێشا.

دوای مەرگی مەهدی کوڕەکەی، باوکی قاسم محەممەد، جێگەی گرتەوە چوونکە باوکی وەك جێگری خۆی ناساندبووی. باوکی قاسم کاتێك مەرگی باوکی ئاشکرا کرد کەجڵەوی هەموو کارەکانی گرتبووە دەست و لەوەی دەیخواست، ئاسوودە بوو. ئەو شێوازی باوکی گرتەبەر. دەستەیەك دژی ئەو راپەڕین بەڵام سەرکوتی کردن. لەسەرسەختترینی ئەم دەستەیە پیاوێك بوو بەناوی کوڕی تالوتی قورەشی. ئەو لەکەنارەکانی تەرابلوس دەژیا و خۆی بەمناڵی مەهدی دەزانی. دەستەیەك پەیوەستی بوون و ئەو هێرشی کردە سەر شاری تەرابلوس و رووبەرووی دانیشتوانەکەی بوویەوە بەڵام درۆی ئەو بۆ هاوەڵانی ئاشکرا و سەرئەنجام سەرپیان بڕی و سەرەکەیان بۆ قائیم، باوکی قاسم ڕەوانە کرد.

قائیم سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی مەیسوری فەتی بۆ مەغریب ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە گەیشتە فاس و دواتر تەکرور. لەوێ لەگەڵ پیاوێکی خارجی جەنگی و شکستی پێهێنا ومناڵەکەی ئەسیر کرد. دواتر سوپایەکی بۆ دەریا ڕەوانە کرد و یەعقوب کوڕی ئیسحاقی کردە فەرماندەی ئەم سوپایە بەمەبەستی هێرش کردنە سەر رۆم. یەعقوب دەستەیەکی ئەسیر و لەشاری جەنوە تالانی زۆری کۆکردەوە. هەروەها سوپایەکی بەفەرماندەیی خزمەتکارەکەی خۆی زەیدان بەرەو میسر نارد. سامانێکی زۆری بۆ ئەم سوپایە تەرخان کرد. ئەم سوپایە ڕۆشتە ناو

ئەسکەندەرییە و محەممەد کوڕی ئەخشید سوپایەکی گەورەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم سوپایە ئامادە کرد و ڕووبەڕوویان بوویەوە. دەرئەنجام مەغربییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر کرا. مەغربییەکان شکست خواردوو، گەڕانەوە.

## زاڵبوونی مەرداویج لەئەهواز

کاتێك هەواڵی زاڵبوونی عەلی کوڕی بویە لەفارس بەرمەرداویج گەیشت، ڕووی کردە ئیسفەهان تا بیر لەچارەیەك بکاتەوە. بەباشی زانی سوپایەك بۆ ئەهواز ڕەوانە بکات و بەم شێوەیە ئەگەر عیماد ئەلدەولە مەبەستی جەنگی ئەوی دەکرد، ڕێگەکانی لێ دەبەسترا و چیتر نەیدەتوانی خۆی بەخەلیفە بگەیێنێت. دواتر خۆی لەئیسفەهان و سوپاکەی لەئەهوازەوە هێرشی بکەنەسەر و لەناوی ببەن.

سوپاکەی مەرداویج لەرەمەزان/ ئۆگۆست بەرێکەوت و گەیشتە ئەیزە. یاقوت ترسا لەوەی نەکا لەنێوان ئەو و کوڕی بویە گەمارۆ بدرێت و بۆ ئەم مەبەستە ڕێگەی ئەهوازی گرتەبەر و موزەفەری کوڕی هاورێیەتی دەکرد. ئەو نامەیەکی بۆ رازی نووسی تا فەرمانڕەوایەتی ئەهوازی پێ بسپێرێت. رازی ڕەزامەندی نیشاندا. باکوی عەبدوللە کوڕی بورەیدی دەبیری یاقوت لەگەڵ ئەرکەکانی خۆی، لێپرسراوی کۆکردنەوەی باجی ئەهوازیش بوو و براکەی باوکی عەبدوللە، باوکی حسەین، وەك نوێنەری یاقوت لەبەغداد دەستنیشان کرا.

لەم کاتەدا سوپاکەی مەرداویج لەسەرەتای شەوال/ چواردەی سێپتامبەری ئەمساڵە دەستی بەسەر رامهورموزدا گرت و دواتر سوپا ڕێگەی ئەهوازی گرتەبەر بەڵام یاقوت لەسەر پردی ئەربەق ڕێگەی لێ بەست. سوپا لەبەر خرۆشانی ئاوەکە توانای پەڕینەوەی نەبوو و بۆ ماوەی چل ڕۆژ لای پردەکە مایەوە. دواتر سوپا پردەکەی بەجێهێشت و لەتەنکاوەکانی موسرەقان پەڕییەوە و یاقوت ئاگادار بوویەوە. لەکاتێکدا دوو ڕۆژ پێشتر لەبەغدادەوە هاوکاری پێ گەیشتبوو. یاقوت لەگەڵ هێزە پشتیوانەکان ڕووی کردە گوندی ریخ و لەوێوە ڕێگەی واستی گرتەبەر کە لەو کاتەدا لەژێر فەرمانی رائیقدا بوو. ئەو ڕۆژئاوای واستی بۆ یاقوت چۆڵ

کرد و یاقوت لەوێ ئوردووی لێدا.

کاتێك عیماد ئەلدەولە لەزاڵبوونی مەرداویج لەرامهورموز ئاگادار بوویەوە، نامەیەکی بۆ نوێنەرەکەی مەرداویج نووسی و ڕێزی گرت. داوای لێکرد لەنێوان ئەو و مەرداویج ببێتە نێوەنجیگەر. نوێنەری مەرداویج ئەو کارەی کرد و بۆ ئەم مەبەستە هەوڵەکانی خستە گەڕ. مەرداویج بەو مەرجە رازی بوو عیماد ئەلدەولە ملکەچی فەرمانەکان بێت و بەناوی ئەو وتار بخوێنێتەوە. بەم شێوەیە بارودۆخ لەنێوان ئەوان سەقامگیر و کوڕی بویە دیاری گرانبایی بۆ مەرداویج ڕەوانە کرد. هەروەها ڕۆکن ئەلدەولەی برای وەك بارمتە بۆ دەرگای مەرداویج نارد و لەسەرزەمینی خۆی بەناوی مەرداویج وتاری خوێندەوە و ڕەزامەندی مەرداویجی بەدەست هێنا بەڵام وەك ئاماژەی پێدەدرێت مەردوایج کوژرا و پێگەی کوڕی بویە بەرز بوویەوە.

## گەڕانەوەی یاقوت بۆ ئەهواز

کاتێك یاقوت گەیشتە ئەهواز، لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی مەرداویجیان کوشت. باوکی عەبدوللە بورەیدی وەك دەبیر هاوڕێیەتی یاقوتی دەکرد. کاتێك مەرداویج کوژرا، یاقوت بۆ ئەهواز گەڕایەوە و دەستی بەسەر ئەم سەرزەمینەدا گرت.

کاتێك یاقوت دوای مەرگی مەرداویج، گەیشتە عەسکەری موکرەم، سوپای کوڕی بویەی لەوێ بینی کەپێشتر خۆیان گەیاندبووە ئەو ناوچە. دوو سوپا لەئەرجان ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و کوڕی بویە خۆی گەیاندە سوپاکەی. ئاگر جەنگێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند و یاقوت شکستی خوارد و چیتر سەرکەوتنی بەخۆیەوە نەبینی.

باوکی عەبدوللە بورەیدی نامەیەکی بۆ کوڕی بویە نووسی و سازی ئاشتی لێدا. کوڕی بویە رازی بوو و ئەویش بۆ خەلیفە رازی نووسی و خەلیفەیش ڕەزامەندی خۆی نیشاندا و سەرزەمینەکانی فارسی بەکوڕی بویە سپارد. کوڕی بویە لەشیراز مایەوە و یاقوت لەئەهواز لەگەڵ کوڕی بورەیدی ئوردووی لێدا.

محەممەد کوڕی یاقوت ڕۆشتبووە بەغداد و وەك پەردەداری خەلیفە

دیاریکرابوو. رازی خەڵاتی پێ بەخشی. ئەو لەگەڵ پەردەداری، فەرماندەیی سوپایشی لەئەستۆدا بوو و خۆی لەکاروباری دیوانەکانیش هەڵدەقورتاند و فەرمانی پێدەدان تا بەهیچ نووسراو یا فەرمانێك بۆ هێنانە سەرکار یا لابردنی کەسێك رازی نەبن مەگەر ئەوەی مۆری ئەوی لەسەر بێت و فەرمانی دەدا هەموان لەکۆرەکانی ئەو کۆببنەوە. باوکی عەلی کوڕی موقلە بۆ ئەم کارانەی ئەو خۆڕاگری کردە پیشە و خۆی ناچار دەکرد هەندێ کات لەدانیشتنەکانی کوڕی یاقوت ئامادە بێت وەك کەسێك کەهیچ دەسەلاتێکی بەدەستەوە نەمابێت.

لەم چەند رۆژەدا چەندین رووداوی گەورە روویاندا کەبریتی لە:

گەڕانەوەی وەشمگیر، برای مەرداویج لەئیسفەهان لەگەڵ فەرمان نامەی قاهیر دوای ئەوەی بەسەریدا زاڵ ببوو. قاهیر، محەممەد کوڕی یاقوەتی وەك فەرمانڕەوای ئیسفەهان دیاریکرد و خەڵاتی بۆ نارد و دوای ئەوەی رازی هاتە سەرکار و محەممەد کوڕی رائیق بوو بەپەردەدار، ئەو لەسەر کار لابرا و محەممەد کوڕی یاقوت لەرامهورموزەوە هاتە بەغداد و وەك پەردەداری خەلیفە دەستنیشان کرا ئەمە لەکاتێکدا بۆ گرتنەدەستی فەرمانڕەوایەتی ئیسفەهان بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوتبوو. مەرداویج، وەشمگیری برای بۆ ئیسفەهان نارد و عەلی کوڕی بویە فەرمانڕەوایەتی ئەرجانی گرتەدەست. ئەم پێشهاتانە لەماوەی حەفتا رۆژ روویاندا. ((تبارك الله بيده الملك و الملكوت کەکارەکان بەویستی خۆی بەرەو پێش دەبات و جگە لەو هیچ خوایەك بوونی نییە)).

## کوژرانی هارون کوڕی غەریب

لەم ساڵەدا هارون کوڕی غەریب کوژرا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: وەك ئاماژەی پێدرا، قاهیر ئەوی وەك فەرمانڕەوای ماه کوفە (ئەگەری هەیەهەمان دەینەوەر بێت) و ماسەبزان و کەنارەکان دەستنیشان کرد. کاتێك قاهیر لەسەر کار لابرا و رازی جێگەی گرتەوە، هارونی بۆ وەزارەت بەشیاو زانی چوونکە پەیوەندی خزمایەتی ئەوانی کۆدەکردەوە. هارون، کوڕی خاڵی موقتەدر بوو. ئەو نامەی بۆ سەرکردەکانی بەغداد نووسی و بەڵێنی چاکەکاری و زیاد کردنی مانگانەی پێدان.

دواتر لەدەینەوەرەوە رووی کردە خانەقین. کوڕی موقلە و سوپای ساجییە و حەجەرییە ئەمەیان پەسەند نەدەکرد. هەموویان کۆبوونەوە و لای رازی سکاڵایان بەرز کردەوە. رازی پێی وتن حەز بەهاتنی ئەو ناکات و مۆڵەتی پێدان رێگە لەهاتنی ئەو بگرن. ئەوان سەرەتا نامەیان بۆ هارون نووسی و جیاواز لەفەرمانڕەوایەتی سنوورەکانی ژێر دەستی، فەرمانڕەوایەتی رێگەی خوراسانیان پێدا بەڵام هارون رازی نەبوو و رێگەی نەهرەوانی گرتەبەر و دەستی بەکۆکردنەوەی باج کرد. رێگەی ستەمکاری لەگەڵ خەڵکانی گرتەبەر و پێگەی بەرز بوویەوە.

محەممەد کوڕی یاقوت لەگەڵ سوپاییەکانی بەغداد، بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و لەنزیك ئەو ئوردووی لێدا. دەستەیەك لەپێشەنگەکانی دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و چەند کەسێك لەهاوەڵانی کوڕی یاقوت، پەیوەستی سوپاکەی هارون بوون. محەممەد نامەی بۆ نووسی و دیاری گرانبایی بۆ نارد بەڵام هارون رازی نەبوو و وتی: دەبێت بڕۆمە ناو بەغداد.

لەرۆژی سێشەممە، بیست و چواری جومادی الاخرە/ سیانزەی جون، دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگێکی مەترسیدار دەستی پێکرد. سوپاکەی هارون سەرکەوتنیان بەدەست هێنا چوونکە ژمارەیان زیاتر بوو و زۆربەی سوپاکەی کوڕی یاقوت شکستی خوارد و سامانەکانیان تاڵان کرا و ژمارەیەکی زۆریان بریندار و کوژران. محەممەد کوڕی یاقوت ڕۆشت و پردی بینی شکاند. هارون ئاگادار بوویەوە و بەتەنیا هێرشی کردە سەر پردەکە و بۆ کوشتن یا گرتنی محەممەد کوڕی یاقوت، بڕیاریدا. ئەسپەکەی خۆی کردە پرد تا بپەڕێتەوە بەڵام کەوتە ناو رووبارەکە. یەکێك لەکۆیلەکانی محەممەد کوڕی یاقوت بەناوی یومن بەتەور برینداری کرد و ئیسقانەکانی شکاند. دواتر لەئەسپەکەی هاتە خوار و سەری بڕی. دەنگی بەرز کردەوە. سوپاکەی هارون هەڵاتن و دەستەیەك لەوان بەنهێنی ڕۆشتنە ناو بەغداد. سامانەکانی هارون تاڵان و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی کوژران و دەستەیەکیان ئەسیر کران.

محەممەد ڕۆشتە سەر جەنازەکەی هارون و فەرمانیدا بیبەنە خێوەتەکەی و

بیشۆن و کفنی بکەن. دواتر نوێژی لەسەر خوێند و بەخاکی سپارد و کەسانێکی بۆ ماڵەکەی نارد تا تالآن نەکرێت. ئەو لەکاتێکدا سەری هارون و دەستەیەك لەسەرکردەکانی لەپێشەوە دەبرا، ڕۆشتە ناو بەغداد. سەری کوژراوەکان بەڕمەوە هەڵواسران.

## دەرکەوتنی پیاوێك کەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد

لەم ساڵەدا لەباسند، کەنارەکانی سەغانییان (ڕۆژهەڵآتی ئێران) پیاوێك دەرکەوت کەبانگەشەی پێغەمبەری دەکرد و خەڵکان دەستە دەستە پەیوەستی دەبوون و ژمارەیەکی زۆر شوێنی کەوتن. ئەو ڕووبەڕووی نەیارەکان بوویەوە و ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کوشت کە بەدرۆزنیان لەقەڵەم دەدا.

شوێنکەوتەکانی لەچاچ فراوان بوون.

ئەو پیاوێکی فریدەر و دەغەڵکار بوو. دەستی خۆی دەخستە ناو حەوزێك و مشتێك دیناری دەردەهێنا. فرت و فێڵی لەم چەشنەی بەکار دەبرد تا ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. باوکی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی موزەفەر سوپایەکی بۆ سەرکوت کردنی ئەو نارد. ئەم سوپایە ڕووبەڕووی بوویەوە و بارودۆخی لێ دژوار کرد تا سەرئەنجام لەسەر بەرزایی کێوێك گرتیان و کوشتیان و سەریان بۆ لای باوکی عەلی برد. ئەم سوپایە ژمارەیەکی زۆر لەشوێنکەوتەکانی ئەو پیاوەیشی کوشت. بەخەڵکانی وتبوو هەرکات بکوژرێت بۆ جیهان دەگەڕێتەوە و لەبەر ئەمە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ چاوەڕوانی گەڕانەوەی بوون بەڵآم سەرئەنجام بلآوەیان لێکرد و کەم کەم لەناوچوون.

## كوژرانی شەلەمغانی و چۆنیەتی ئایینەکەی ئەوە

لەم ساڵەدا باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی شەلەمەغانی ناسراو بەکوڕی قەراقر کوژرا. شەلەمغان گوندێك لەکەنارەکانی واستە.

هۆکاری کوژرانەکەی ئەمە بوو کەئەو بناغەی ئایینێکی تازەی داڕشت کە لەشیعەگەری بەتەناسوخ و دەرکەوتنی خواوەند لەجەستەی کەسانیتر باوەڕدار بوو. باوکی قاسم کوڕی حسەین کوڕی رووح کەشوێنکەوتەکانی ئەمامییە بەباب ناوی دەبەن و نوێنەری حامید کوڕی عەباسی وەزیر بوو، پشتیوانی لێدەکرد.

باوکی جەعفەری شەلەمغانی پەیوەندی لەگەڵ موحسن کوڕی باوکی حەسەن کوڕی فورات لەسەردەمی وەزارەتی سێیەمی باوکی بەست و خاقانی لەسەردەمی وەزارەتی خۆی فەرمانی گرتنی ئەوی دەرکرد. شەلەمغانی لەم کاتەدا خۆی شاردەوە و بۆ موسڵ هەڵات و چەندین ساڵ لای ناسر ئەلدەولە حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدان، لەکاتی ژیانی باوکی عەبدوللە کوڕی حەمدان، ژیانی بەسەر برد و دواتر رووی کردە بەغداد و خۆی شاردەوە. دواتر لەبەغداد بیسترا ئەو خۆی بەخواوەند ناو دەبات. دەوترا حسەین کوڕی قاسم کوڕی عەبدوللە کوڕی سلێمان کوڕی وەهب، وەزیر موقتەدر و باوکی جەعفەر و باوکی عەلی دوو کوڕەکەی بێستام و ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی باوکی عەون و کوڕی شەبیب زەیات و ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوس باوەڕیان پێ هێناوە. ئەم راستییە لەوتەکانی ئەواندا هەستی پێدەکرا. لەرۆژگاری وەزارەتی کوڕی موقلە شوێنیان کەوتن و ئەوان خۆیان شاردەوە وکەس نەیتوانی بیانگرێت.

لەشەوال/ سێپتامبەری ساڵی ٩٣٤/٣٢٢ شەلەمغانی دەرکەوت و کوڕی موقلەی وەزیر ئەوی گرت و زیندانی کرد. ماڵەکەی تالآن کرا و لەوێ نامەی چەندین کەسیان دۆزییەوە کەباوەڕیان بەئایینەکەی ئەو هێنابوو و بەشێوەیەك لەنامەکاندا ناویان بردبوو کەهیچ مرۆڤێك، مرۆڤێکی دیکە بەو ناوە بانگ ناکات. دەستخەتی حسەین کوڕی قاسم لەماڵەکەی ئەودا دۆزرایەوە. دەست نووسەکان لەلایەن خەڵکەوە ناسرانەوە. نامەکانیان نیشانی شەلەمغانیدا و ئەو ناوی هەموویانی برد و دواتر لەدینەکەی خۆی هەڵگەڕایەوە و باوەڕی بەئیسلام هێنا و لەوەی سەبارەت

بەو دەیانهێنایە سەرزمان، بێزاری خۆی نیشان دەدا. کوڕی باوکی عەون و کوڕی عەبدوسیان لەگەڵ ئەو گرت و لەگەڵ ئەو، بردیاننە بارەگای خەلیفە. فەرمان بەو دوانە درا شەقەزللە لەروخساری شەلەمغانی بدەن بەڵام رازی نەبوون و کاتێك ناچار کران، کوڕی عەبدوس دەستی خۆی درێژ کرد و شەقەزللەی لێدا بەڵام کوڕی باوکی عەون دەستی خۆی بۆ سەر و ڕیشی شەلەمغانی درێژ کرد بەڵام دەستەکانی لەرزین و سەر و ڕیشی شەلەمغانی ماچ کرد و وتی: خواوەندی من و سەروەر و رۆژی دەری من. رازی وتی: ئێستایش گومان دەکەیت بانگەشی خوایەتیت نەکردووە، ئەی ئەم قسانە چییە؟ شەلەمغانی وتی: وتەکانی کوڕی باوکی عەون بەمن چی؟ خواوەند دەزانێت هیچ کات پێم نەتووە کەخوام.

کوڕی عەبدوس وتی: ئەو هیچ کات بانگەشەی خوایەتی نەکردووە و تەنیا خۆی لەجێگەی کوڕی روەح بەبابی ئیمامی چاوەڕوانکراو دەزانی و من گومانم دەکرد ئەو لەبەر خۆپارێزی وا دەڵێت. بەئامادە بوونی فەقیە و قازی و داوەرەکان چەند جارێك لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردن و لەدوایین رۆژەکان فەقیهەکان کوشتنی ئەویان بەڕەوا زانی و کوڕی شەلەمغانی و کوڕی عونیان چوارمێخە کێشا و دواتر هەردووکیان سوتێنران. ئەم پێشهاتە لەزیقەعدە/ ئۆکۆتبەر روویدا.

یەکێك لەئایینەکانی شەلەمغانی ئەوە بوو، کەئەو، خوای خواکانە کەراستییەکان دێنێتەدی و سەرەتایە و کۆن، ناخ و رواڵەت، رۆژیدەر و تەواو و بەهەموو ماناکان ئاماژە بۆ ئەو دەکرێت. ئەو دەیوت: خوای گەورە و پاك، لەهەر شتێك بەئەندازەی توانایی ئەو شتە دەردەکەوێت و ئەو دژی ئافراند تا دژبەر بناسرێت. بەهەمان شێوە کە لەکاتی ئافراندنی ئادەم ڕۆشتە ناو جەستەی و لەشەیتانیش و هەرکام لەم دوانە دژی ئەوی دیکەیە چوونکە لەمانادا دژن وئەوەی بەڵگە بۆ راستی لەخودی راستی باشترە و دژی شتێك لەهاوشێوەی ئەو شتە پێی نزیکترە و هەرکات خواوەند بڕواتە ناو جەستەیەك، هێز و مۆجیزەیەکی ئەوتۆ دەردەکەوێت کەبەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەوە خوایە. کاتێك ئادەم دیارنەما، لاهوت لەناو پێنج ناسوتەکە دەرکەوت و هەرکام لەوان لەناو بچێت، ئەوی دیکە جێگەی دەگرێتەوە. پێنج شەیتانەکە پێنج دژیان هەیە کەواتە لاهوت لەئیدریس و

ئیبلیسی ئەو کۆبوویەوە و دواتر ئەم دوانە بلاوەیان لێکرد بەهەمان شێوە کەدوای ئادەم بلاوەیان لێکرد، دواتر لەهود و ئیبلیسی ئەو دەرکەوت و ئەو دوانەیش بلاوەیان لێکرد، دواتر لەسالح و ئیبلیسی ئەو کۆبوویەوە و بلاوەیان لێکرد، دواتر لەئیبراهیم و ئیبلیسی ئەو نەمرود کۆبوویەوە و هەردووکیان بلاوەیان لێکرد، دواتر لەهارون و ئیبلیسی ئەو فیرعەون دەرکەوت و دوای لەناوچوونی ئەو دوانە بلاوەی لێکرد، دواتر لەسلێمان و ئیبلیسی ئەو کۆبوویەوە و دوای لەناچوونی ئەو دوانە بلاوەی لێکرد و دواتر لەعیساو ئیبلیسەکەی دەرکەوت و دوای لەناوچوونی ئەو دوانە لەقوتابییەکانی عیسا و ئیبلیسەکانی ئەوان دەرکەوت و دواتر لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئیبلیسەکەی دەرکەوت و دواتر خواوەند لەهەموو دیاردە و ماناکان دەرکەوت و ئەو لەهەر کەسێك لەبیرێکدایە کە بەدڵی ئەودا تێپەڕ دەبێت، ئەگەر مرۆڤ بەباشی وێنەی بکات، ئەوەی شاراوەیە بەشێوەیەك بۆی ئاشکرا دەبێت وەك بڵێی دەیبینێت. الله ئیسمێکی مانادارە و ئەوەی خەڵکان نیازمەندن پێی الله یە و لەبەر ئەمە خەڵکان دەبێت لە اله بپارێنەوە. شوێنکەوتەکانی ئەو دەیانوت: ئەو (ڕەب، واتە خواوەند) هەر کەسێکە کەپێگەیەکی نزمتری هەیە تا ئەو جێگەی دەیانوت: من ڕەبی فلانە کەسەم فلانەکەس ڕەبی فلانی و فلانی ڕەبی منە تا ئەوەی لەکۆتاییدا نۆرەی کوڕی قەراقر دەگات و دەڵێت: من رەب الاربابم (خواوەندی خواوەندەکان) کەدوای ئەم ڕەبە، ڕەبوبیەتی دیکە لەئارادا نییە.

شوێنکەوتەکانی شەلەمغانی حەسەن و حسەین یان بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەدەگەڕاندەوە چوونکە هەرکەس خواوەندی لەودا کۆببێتەوە چیتر نەمناڵی دەبێت نەباوك. ئەوان موسا و محەممەدی پێغەمبەریان بەخیانەتکار دەزانی و دەیانوت: هارون، موسای ڕەوانە کرد و عەلی، محەممەدی نارد بەلام ئەم دوانە خیانەتیان کردە پیشە. ئەم دەستەیە گومانیان دەکرد عەلی بەئەندازەی تەمەنی ئەسحابی کەهف دەرفەتی بەمحەممەدی پێغەمبەر(د.خ) بەخشی کەهەرکات ئەم سالانە بەسەر بچێت، شەریعەت گۆڕانکاری بەسەر دێت. ئەوان گومانیان دەکرد مەلائیکە کەسانێکن کەخاوەنی نەفسی خۆیان بن و راستییەکان بناسن و بەهەشت، هەمان ناسین و دینداری ئەوانە و درۆزن، نەزانی و هەڵگەڕانەوەی ئەوان لەئایینەکانە.

ئەوان نەباوەڕیان بەنوێژ بوو نەڕۆژوو و نەهیچ پاڕانەوەیەکی دیکە. بۆ پەیوەندی هاوسەرگیری، ڕێ و ڕەسمی مارە بڕینیان ئەنجام نەدەدا و هەر ژنێکیان بۆ خۆیان بەڕەوا دەزانی و گومانیان دەکرد محەممەد بۆ گەورە و ستەمکارانی و خۆپەسەندەکانی عەرەب ڕەوانە کراوە و فەرمانی سوجدەی بەوان داوە. شەلەمغانی دەیوت: فرەزانی ئەوەیە خەڵکان بە بەڕەوا زانینی ناموسیان تاقی بکرێنەوە، مرۆڤ دەتوانێت لەگەڵ کەسە مەحرەمەکانی خۆی و کەسە مەحرەمەکانی هاورێکەی نزیکی بکات، و دوای ئەمە زەمانێك دێت هەموان بەئایینەکەی ڕازی دەبن. بەپێی گومانی ئەو مرۆڤی بالأدەست لەژنی ژێر دەستی خۆی نزیك ببێتەوە تا تیشك بەجەستەی ئەو بگەیێنێت و هەرکەس لەم کارە خۆی بەدوور بگرێت، لەژیانی داهاتووی وەك ژن، چاو بەدنیا هەڵدێنێت (دەبێتە ژن) چوونکە ئەوان باوەڕیان بەتەناسوخ[٢٢] بوو و لە لەناوچوونی تالبییەکان و عەباسییەکان دڵنیا بوون. گەورە و پاکە خواوەند لەوەی ستەمکاران و ناباوەڕان بۆی هەڵدەبەستن.

لێکچوونەکانی ئەم باوەڕە بەباوەڕداران بەنەسرییە فراوانە بەشێوەیەك دەڵێی لەیەك جیانین. نەسرییە باوەڕیان بەکوڕی فورات بوو و ئەویان بەپێشەوای ئایینەکەی خۆیان دەزانی.

حسەین کوڕی قاسم لەو کاتەدا لەرەققە بوو. ڕازی کەسی بەدوای ئەودا نارد و لەکۆتایی زیقەعدە/ سیانزەی نۆڤەمبەر کوشتیان و سەرەکەیان بۆ بەغداد برد.

---

[٢٢]- زیندوو بوونەوەی مرۆڤ دوای مردن، واتا جەستە لەناو دەچێت بەڵام ڕۆح دەمینێت و لەکۆرپەلەیەکی دیکەدا بۆ ئەم ژیانە دەگەڕێتەوە. وەرگێر

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یاقوت، پەردەداری خەلیفە، نوێنەری خۆی بۆ لای باوکی تاهیر قەرەمتی نارد و پێشنیاری فەرمانبەری خەلیفەی پێکرد بەو مەرجەی ئەوەی لەدەستی باوکی تاهیردایە، لەژێر دەستیدا بمێنێتەوە و فەرمانڕەوایەتی هەرناوچەیەك کەدەخوازێت، پێی بسپێردرێت. ئەو ڕێزی لەقەرەمتی گرت و داوای لێکرد دەست لەکوشتار وتالآن کردنی حاجییەکان هەڵگرێت و ڕێگەیان لیٚ نەگرێت بەلأم ئاماژەی بەگەڕاندنەوەی بەردی ڕەش بۆ مەککە نەکرد. قەرەمتی داوای لەمحەممەد کوڕی یاقوت کرد ڕێگەی هاتنی خواردەمەنی لەبەسرەوە بۆ ئەو بکاتەوە تا ئەویش لەسنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی لەهەجەر بەناوی خەلیفە وتار بخوێنێتەوە. حاجییەکان ڕۆشتنە مەککە و گەڕانەوە بیٚ ئەوەی قەرەمتیەکان ڕێگەیان لیٚ بگرن.

لەزیقەعدە/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە محەممەد کوڕی یاقوت بۆ جەنگ لەگەڵ سوپاکەی مەرداویج مەبەستی ئەهوازی کرد و فەرمانی بەسوپای ساجییە و حەجەرییەدا بۆ هاورێیەتی ئەو خۆیان ئامادە بکەن. سامانی خستە بەردەستیان بۆ ئەوەی بۆ ئامادە کردنی خۆیان بەکاری ببەن بەلأم هەموو سەربازەکان ڕازی نەبوون و بیریان کردەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر ماڵی محەممەد کوڕی یاقوتیان کرد. محەممەد کوڕی یاقوت بەشێوەیەکی توند لەگەڵیان ئاخاوت. ئەوانیش جوێنباران وماڵەکەیان بەردباران کرد. بۆ بەیانی دووبارە مەبەستی ماڵەکەی ئەویان کرد و بەشێوەیەکی توند لەگەڵی دوان و شمشێریان بەرووی هاوەڵآنی ئەو دەرکێشا. هاوەڵآنی محەممەد و کۆیلەکانی، تیربارانیان کردن. شۆڕشییەکان گەڕانەوە و محەممەد لەهێرش کردنە سەر ئەهواز دەستی هەڵگرت.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەهاوەڵآنی باوکی تاهیر قەرەمتی سوار لەسەر کەشتی هێرشیان کردە سەر توج. کاتێك ئەم دەستەیە لەکەشتییەکانی خۆیان دوورکەوتنەوە، فەرمانڕەوای شار دەستەیەکی نارد و کەشتییەکانیان سووتاند. خەڵکانی شارەکە کۆبوونەوە و جەنگیان لەگەڵ قەرەمتییەکان دەست پێکرد. دەستەیەك لەقەرەمتییەکان کوژران و دەستەیەکیان ئەسیر کران کەکوڕی غومر،

یەکێك لەگەورەترین بانگەشەکەرانی قەرمەتی، لەناو ئەواندا دەبینرا. ئەم دەستەیە لەرۆژگاری قاهیر، بەریسوایی هێنرانە ناو بەغداد و زیندانی کران. سەرەئەنجامی ژیانی ئەوان بەوە کۆتایی هات کە لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی رۆژگاری قاهیر، ئاماژەمان پێدا.

لەم ساڵەدا قاهیر باللە، ئیسحاق کوڕی ئیسماعیلی نەوبەختی کوشت کەقاهیر بۆ خەلافەت دەستنیشان کردبوو. ئیسحاق هاوشێوەی چوارپێیەك بوو کە بەسمی خۆی مەرگی لەژێر زەوی هەڵدەکۆڵی. باوکی سەرایا کوڕی حەمدان کەبچوکترین منالی باوکی بوو، کوژرا. هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو قاهیر پێش خەلافەت دەیویست دوو کەنیزی گۆرانیبێژ بکرێت. بەلاّم ئەم دوانە بەهای زیاتریان بۆ کڕینی کەنیزەکاندا و قاهیر ڕقی ئەوانی لەدڵ گرت. کاتێك قاهیر مەبەستی کوشتنی ئەوانی کرد، هەردووکیانی بۆ شەونشینی بانگێشت کرد. هەردووك جل و بەرگی جوانیان لەبەر کرد و بۆنی خۆشیان لەخۆیاندا و هاتنە بارەگای قاهیر. قاهیر فەرمانیدا لەبەر چاوی خۆی هەردووکیان بخەنە ناو سیاچاڵەکانی کۆشکەکەی. ئەو دوانە قوڕقوڕ گریان بەلاّم قاهیر گرنگی بەفرمێسکی ئەوان نەدا و هەردووکیانی خستە ناو چاڵەکە و بەگڵ داپیۆشین.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر کوڕی موقسیمیان لەبەغداد بردە ماڵی سەلامەی پەردەدار. پێی وترا خوێندنەوەیەکی تازەی لەقورئان هێناوەتە ئاراوە کەپێشتر بوونی نەبووە. کوڕی موجاهید، قازی و قورئان خوێنەکانی کۆکردەوە و ئەوان گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و ئەو دانی بەهەڵەکەی خۆیدا نا و تۆبەی کرد. کتێبەکانی ئەویان سووتاند.

لەم ساڵەدا دوموستوقی قەرقاش لەگەڵ پەنجا هەزار رۆمی بەرێکەوت و گەیشتە مەڵتییە و بۆماوەیەکی دوور و درێژ گەمارۆی خستەسەر. زۆربەی دانیشتوانی شارەکە لەبرسا مردن. لەوێ دوو خێوەت هەڵدرا کەیەکیان خاچی تێدا بوو. قەرقاش وتی: هەرکەس دەخوازێت ببێتە مەسیحی بڕواتە ئەو خێوەتەی خاچەکەی تێدایە تا هەم بنەماڵەکەی بۆ بگەڕێتەوە هەم سامانەکەی و هەرکەس خوازیاری ئیسلامە بڕواتە خێوەتەکەی دیکە. ئەو کەسەی دەڕواتە خێوەتی ئیسلام

تەنیا گیانی خۆی دەپارێزێت وئێمە دەیبەینە پەناگایەکی ئەمن. زۆربەی موسوڵمانان لەبەر رزگار کردنی ژیانی خۆیان و بنەماڵە و سامانەکانیان ڕۆشتنە ئەو خێوەتەی خاچەکەی تێدا بوو. یەکێك لەفەرماندە ڕۆمییەکان موسوڵمانەکانی بردە پەناگایەك. ئەمە لەرۆژی یەکشەممە، سەرەتای جومادی الاخرە/ ئاوریل ڕوویدا. ڕۆمییەکان هەروەها دەستیان بەسەر سەمیساتیش گرت و هەموو شوێنێکیان وێران و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ئەو بەڵایان بەسەر ژنەکاندا هێنا کەشیاو نییە (دەستدرێژییان کردنەسەر). بەم شێوەیە توانییان دەسەڵاتی خۆیان لەزۆربەی ناوچەکان بڵاو بکەنەوە.

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی محەممەد کوڕی عودەی باوکی نەعیم، فەقیهی جورجانی ئێسترئابادی و باوکی عەلی ڕوودباری سۆفی بەناوی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی قاسم هەردووکیان مردن. دەستەیەك مردنی ڕوودباری بۆ ساڵی ٩٣٥/٣٢٣ زایینی دەگێڕنەوە.

لەم ساڵەدا خەیر کوڕی عەبدوللەی نەساجی سۆفی لەدانیشتوانی سامەرا و محەممەد کوڕی عەلی کوڕی جەعفەر ئەبوبەکری کەنانی، سۆفی ناودار لەهاوەڵانی جونەید و باوکی سەعیدی خەراز کۆچی دواییان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و سێی کۆچی ( ٩٣٥ زایینی )

### کوژرانی مەرداویج

لەم ساڵەدا مەرداویجی دەیلەمی فەرمانڕەوای سەرزەمینی جەبەل (چیاکان) و ناوچەکانی دیکە کوژرا.

هۆکاری کوژرانەکەی ئەوە بوو بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ تورکەکان دەکرد و باوەڕی وابوو ڕۆحی سلێمان کوڕی داود لەجەستەی ئەودایە و تورکەکان شەیتان و دوورخراوەکانن، ئەگەر باروددۆخ لەوان دژوار بکات، لەشوێنی خۆیان ناجووڵێن و جیاواز لەوە خراپەکاری دەکەنە پیشە. بەم شێوەیە مەرداویج بوو بەبارێکی گران و قورس بەسەر شانی تورکەکان و خوازیاری مەرگی ئەو بوون.

لەشەوی سەری ساڵی ئەم ساڵە، کەهەمان شەوی ئاگر کردنەوە و گەمە کردن بەئاگر بوو، مەرداویج فەرمانیدا لەکێو و دەشت چیلکە و دار کۆبکەنەوە. چیلکە و چەوێڵیان لەهەردوو لای ئەم دەشتە کە بەبەزەند روود ناسراو بوو، کەڵەکە کرد و لەسەر چیایەك ناسراو بەچیای کەریم کەدەیڕوانییە سەر ئیسفەهان، لەخوارەوە تا سەرەوە ئەو کارەیان کرد. بەشێوەیەك کاتێك ئاگرەکە دادەگیرسا وا دەهاتە بەرچاو کەکێوەکە گڕی گرتووە. فەرمانیدا لەهەموو تەپۆڵکەکانی ئەو کەنارە ئەو کارە ئەنجام بدەن. فەرمانیدا نەوت و نەوت پرژێنەکانیان هینا و بەرادیەك مۆمیان داگیرساند ژماردنیان ئەگەری نەبوو. جیاواز لەوە دوو هەزار باز و قەڵە ڕەشیان ڕاو کرد و پێکانیان نەوتاوی کردن تا بەپێی ئاگرین لەئاسماندا بفڕن. مەرداویج فەرمانیدا و سفرەیەکی گەورەیان ڕاخست کەسەد ئەسپ و دووسەد مانگایان بێ ئەوەی لەت لەتی بکەن، بەساخی برژاندبوو و لەسەر ئەم سفرە دایان نابوو جگە لەژمارەی مەڕەکان کەدەگەیشتە سێ هەزار سەر مەڕ و دە هەزار باڵندەی برژاو و حەڵوایەکی زۆر. بڕیاریدا خەڵك لەسەر ئەم سفرەیە کۆبکاتەوە تا دوای خواردن بەخواردنەوە سەرقاڵ بێت و سەیری گەمە ئاگرینەکان بکات.

لەکۆتایی ڕۆژ، سوار ئەسپەکەی بوو و لەگەڵ کۆیلە پیادەکانی بەدەوری

سفرەکەدا سووڕایەوە و دواتر سەیری چیلکە و چەوێڵە کۆکراوەکانی کرد و لەبەر ئەوەی بیابان بەرفراوان و بەرین بوو، چیلکە و چەوێڵە کۆکراوەکان بەکەم دەهاتە بەرچاو. مەرداویج پەرێشان و توڕە بوو و جوێنی بەو کەسانەدا لێپرسراوی ئەم کارە بوون. بەرادەیەك هەموو ئەو کەسانەی لەوێ ئامادە بوون، ترس دایگرتن. مەرداویج گەڕایەوە بۆ خێوەتەکەی خۆی و خەوت. کەس بوێری ئەوەی نەبوو قسەی لەگەڵ بکات.

فەرماندە و سەرکردە و کەسانی دیکە کۆبوونەوە و هەرکەس شتێکی وت. دەستەیەك دەیانوت: مەرداویج لەم خەرجییە زۆر نیگەران و پەرێشان بووە چوونکە پیاوێکی ڕژد و دەست وشك بوو. دەستەیەك دەیانوت: مەرداویج شێت بووە و دەستەیەك دەیانوت گرفتاری نەخۆشی دڵ هاتووە. بەهەرحاڵ ئەوەندەی نەمابوو ئاژاوە سەر هەڵبدات.

عەمیدی وەزیر لەم بارودۆخە ئاگادار بوویەوە و ڕۆشتە خێوەتەکەی مەرداویج و دانیشت تا لەخەو هەستا و لەهەواڵ و قسە و باسی خەڵکان ئاگاداری کردەوە. مەرداویج لەخێوەتەکەی هاتەدەر و لەسەر سفرەکە دانیشت و سێ پارووی خوارد و هەستا و دواتر کەسانی دیکە هێرشیان کردە سەر سفرەکە. مەرداویج بێ ئەوەی مەی بخواتەوە، ڕۆشتە خێوەتەکەی خۆی و سێ ڕۆژ لەئوردووگاکەی لەدەرەوەی ئیسفەهان مایەوە و خۆی نیشانی کەس نەدا. لەڕۆژی چوارەم، فەرمانیدا ئەسپەکان زین بکەن بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆماڵەکەی لەئیسفەهان. لەم کاتەدا خەڵکانێکی زۆر لەبەردەم خێوەتەکەی کۆبوونەوە و چوارپێکان هێشتا لەدەستی کۆیلەکاندا بوون. حیلەی ئەسپەکان بەرز بوویەوە و کۆیلەکان هەوڵیان دەدا هێوریان بکەنەوە بەڵام چوونکە ژمارەی خەڵکان فراوان بوو، دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە.

مەرداویج لەخەو هەستا و سەیری دەرەوەی کرد. خەڵکانی بینی و لەهۆکاری کۆبوونەوەی ئەوانی پرسی. توڕەیی گوڵی کرد و وتی: ئایا بێ ئەدەبی ئەوان لەسەر سفرە و هەڵبەستنی تۆمەتە ناڕەوکان بەس نەبوو کە ئێستا کاری من کەوتۆتە دەست ئەم سەگانە؟ پرسیاری خاوەن ئەسپەکانی کرد. وتیان: ئەم

ئەسپانە هی کۆیلە تورکەکانە. فەرمانیدا زین لەسەر پشتی ئەسپەکان داگرن و بیخەنە سەر پشتی سوارەکان و ئەسپەکان بۆ تەویلەکان ببەنەوە. هەرکام لەتورکەکان کەبەم کارە رازی نەدبوو بەرادەیەك گرفتاری قامچی دەیلەمییەکان دەبوو کە بەناچاری سەری بۆ فەرمانەکان دادەنەواند. بەشێوەیەکی قێزەون لەگەڵیان جوولانەوە کەریسواترینی کەسەکان پێی رازی نابێت.

مەردوایج لەگەڵ کەسە تایبەتییەکانی خۆی سوار ئەسپ بوو. لەترسان و تۆقاندنی تورکەکان بەردەوام بوو تا ئەوەی دەمەوئێواریٚ گەیشتە کۆشکەکەی خۆی. ئەو پێشتر دەستەیەك لەکۆیلە تورکەکانی ئەشکەنجە کردبوو و ئەوان رق و کینەی مەرداویجیان لەدڵ چاند و مەبەستی کوشتنی ئەویان لەسەردا بوو. بەڵام کەس پشتیوانی لێنەدەکردن و بەروودانی ئەم رووداوە، ئەم هەلەیان قۆستەوە و دەستەیەك لەوان وتیان: خۆڕاگری ئێوە بۆ کارەکانی ئەم ئیبلیسە لەبەر چییە؟ سوێندیان خوارد و بۆ کوشتنی ئەو پەیمانیان بەست.

رۆژێك مەرداویج ڕۆشتە گەرماو. کورتکین بەردەوام لەکاتی تەنیایی و لەگەرماودا پارێزگاری لێدەکرد. مەرداویج ئەو رۆژە فەرمانی پێدا پارێزگاری لیٚ نەکات و ئەویش بەتوڕەییەوە دەستی لەکارەکەی هەڵگرت. کورتکین فەرماندەی پاسەوانەکان بوو. ئەو رۆژە چوونکە توڕە بوو فەرمانی پارێزگاری کردن لەمەرداویجی بەکەس نەدا. هەرکات خواوەند مەبەستی ئەنجامدانی کارێك بکات، هۆکارەکانی ئەمادە دەکات.

مەرداویج حەلاقێکی ڕەشی بوو کە لەناو گەرماودا خزمەتی دەکرد. تورکەکان دڵنەوایی ئەو پیاوەیان دایەوە و ئەو پەیوەستی ئەوان بوو. ئەوان داوایان لەحەلاقەکە کرد لەگەڵ مەرداویج هیچ کەرەستەیەکی جەنگ بۆ ناو گەرماوەکە نەبات. نەریت وابوو خەنجەرێکی یەك زەراعییان لەدەستماڵێکەوە دەپێچا و لەگەڵ ئەو دەیانبردە ناو گەرماو. کاتێك داوای ئەمەیان لەخزمەتکار کرد، وتی: بوێری ئەو کارەم نییە. ئەوان تیغی خەنجەرەکەیان شکاند و تەنیا دەسکەکەیان خستە ناو دەستماڵەکە و پێیاندا.

کاتێك مەرداویج ڕۆشتە ناو گەرماوەکە، خزمەتکار ئەوەی ئەنجامدا پێی

مەوترابوو (خەنجەرە شکاوەکەی لەگەڵ خۆی بردە ناو گەرماوەکە). لەم کاتەدا یەکێکی دیکە لەنۆکەرەکان کەفەرماندەی نۆکەرەکانی کۆشك بوو، هات و لەبەردەم دەرگای گەرماوەکە دانیشت. تورکەکان هێرشیان کردە سەر گەرماوەکە و فەرماندەی نۆکەرەکان هەستا بۆ ئەوەی ڕێگەیان لێ بگرێت. یەکێك لەتورکەکان بەشمشێر لێیدا و دەستی قرتاند. حەلاقە ڕەشەکە هاواری کرد و کەوت. مەرداویج دەنگە دەنگ و هەرا و هوریاکەی بیست و بەرەو لای خەنجەرەکە ڕۆشت تا هەڵیگرێت و خۆی بپارێزێت بەڵام بینی خەنجەرەکە شکاوە و تەنیا دەسکەکەی لێیە. مەرداویج چوارپێیەکی دارینی (خۆی لەسەر دەشۆرد) لەناوەوە خستە بەر دەرگای گەرماوەکە. .چەند کەس لەتورکەکان سەرکەوتن وپەنجێرەی گەرماوەکەیان شکاند و مەرداویجیان تیرباران کرد. مەرداویج ڕۆشتە خەزێنەی ئاوی گەرم و بەشێوەیەکی نەرم و نیان لەگەڵیان دوا و سوێندی خوارد چاکەیان لەگەڵ بکات. بەڵام ئەوان گرنگییان بەوتەکانی نەدا و درەگای گەرماوەکەیان شکاند و ڕۆشتنە ژوور و کوشتیان.

لەو کەسانەی خەڵکیان دژی مەرداویج هان دەدا و کوشتنی مەرداویجیان دەستپێکرد، یەکیان ناوی توزەن بوو کەوەك فەرماندەی سوپای بەغداد دیاریکرا و یاروق و کوڕی بوغرا و محەممەد کوڕی یەنالی تەرجومان لەگەڵ بەجکەم. بەجکەم ئەو کەسە بوو پێش توزەن فەرمانڕەوایەتی عێراقی دەکرد و بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین.

کاتێك تورکەکان مەرداویجیان کوشت، هاوەڵانیان ئاگادار کردەوە. ئەوان سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون و هێرشیان کردە سەر کۆشکەکەی مەرداویج و تاڵانییان کرد و هەڵاتن بێ ئەوەی دەیلەمییەکان ئەوان بناسنەوە چوونکە پێشتر ئەوان بۆ پەیوەست بوون بەدەیلەمییەکان هاتبوونە ناو شارەکە و لەبەر ئەو هۆکارە بوو لەپەیوەست بوون بەمەرداویج دەستیان هەڵگرت.

کاتێك دەیلەمی و گیلانییەکان لەکوژرانی مەرداویج ئاگادار بوونەوە، شوێن تورکەکان کەوتن و تەنیا چەند کەس لەوانیان گرت کەچوارپێکانیان لەڕۆشتن بەجێمابوو. ئەو چەند کەسەیان کوشت و بۆ تاڵان کردنی گەنجینە گەڕانەوە بەڵام

عەمیدی وەزیریان بینی کە لەدەوری گەنجینەکە ئاگری هەڵگیرساندبوو. بەم شێوەیە نەیانتوانی گەنجینە تالاَن بکەن و گەنجینە وەك خۆی مایەوە.

یەکێك لەبابەتە سەرنج ڕاکێشەکان کەباسی دەکرێت ئەوەیە سوپاییەکان لەو ڕۆژە کەتوڕەیی مەرداویجیان بینی، کۆبوونەوە و باسی خراپەکاری و ستەمکاری ئەویان دەکرد. لەم کاتەدا پیرەپیاوێك هاتە لایان کەکەس نەیدەناسی. ئەو کەسوار لەسەر ئەسپ بوو، وتی: کارخراپەکانی ئەم خوا نەناسە زیادی کردووە، ئەمڕۆ ئەو کفن دەکەن و خواوەند گیانی دەگرێت. ئەمەی وت و ڕۆشت. دەستەیەك ترسان و سەیری یەکیان کرد و پیرەکە ڕۆشت. بەخۆیان وت: باشترە شوێن پیرە پیاوەکە بکەوین و بیگرین و شوێن وتەکانی بکەوین نەکا مەرداویج لەم گفتوگۆیە ئاگادار ببێتەوە و چیتر خێرێك لەو پیرەپیاوە بەئێمە نەگات. شوێنی کەوتن بەلاَم کەس نەیزانی چی لێهات.

مەرداویج پێش ئەوەی بکوژرێت، ستەمکاری و زۆرداری کردبووە پیشە و فەرمانیدا بوو تەختێکی لەزێڕ بۆ دروست بکەن تا لەسەری دانیشێت. بۆ سوپاسالارەکان تەختیان لەزیو و سیم دروست کرد. هاوشێوەی تاجەکەی کەسرا، تاجێکی گەوهەر نیشانی دروست کرد. ئەو دەیویست هێرش بکاتە سەر عێراق و دەستی بەسەردا بگرێت و مەدائین و تاق و ئەیوانی خوسرەو سەر لەنوێ دروست بکاتەوە. ئەو کاتەی بەمەبەستەکەی خۆی گەیشت، ئەگەر کەسێك لەگەڵی دەدوا، بەشای شاکان ناوی ببات بەلاَم گرفتاری چارەنووسی خ ی بوو و خەڵکان لەشەڕ و بەلاَی ئەو ئاسوودە بوون. داوا لەخوادەکەین لەزووترین کات شەڕ و بەلاَی هەموو ستەمکاران لەسەرمان لاببات.

کاتێك مەرداویج کوژرا، هاوڕێ دەیلەمی و گیلانییەکانی کۆبوونەوە و ڕاوێژیان کرد و بەیەکیان وت: ئەگەر سەرکردەمان نەبێت، لەناو دەچین. بۆ فەرمانبەری کردنی براکەی وەشمگیر کوڕی زیار هاوهەڵوێست بوون. ئەو باوکی قابوس و لەڕەی ژیانی بەسەر دەبرد. هاوەڵانی مەرداویج تابووتی ئەویان بۆ ڕەی برد. هاوڕێیانی ئەو لەگەڵ وەشمگیری برای لەشارەکە هاتنەدەر و چوار فەرسەنگ پیادە و پێ پەتی، لەگەڵ جەنازەی بێ گیانی مەرداویج ڕێگەیان بڕی. ڕۆژێکی سەرەنج

ڕاکێش بوو.

هاوەڵانی مەرداویج لەئەهواز و کەنارەکان کاتێك لەمەرگی ئەو ئاگادار بوونەوە، نەیانهێشت ئەم هەواڵە ئاشکرا ببێت و ڕێگەی شاری ڕەی یان گرتەبەر و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی وەشمگیر نیشاندا و ئەویان وەك فەرماندەی خۆیان ناساند.

کاتێك مەرداویج کوژرا، ڕۆکن ئەلدەولە برای عیماد ئەلدەولە، لای ئەو بارمتە بوو –پێشتر ئاماژەمان پێدا– ڕۆکن ئەلدەولە پارەی بەپاسەوانەکانی خۆیدا و ئەوان ڕزگاریان کرد. ئەو ڕۆشتە دەشت تا زنجیرەکانی خۆی بپچڕێنێت. لەناکاو چەند ئێسترێك بەبارە کا (ئالیك) لێی نزیك بوونەوە کەهاوریێ و کۆیلەکانی خۆی لەسەر بوون. ئەوان بارەکانیان خست و زنجیرەکانیان کردەوە و سوار چوارپێکان بوون و لەگەڵ ئەو بۆ لای براکەی عیماد ئەلدەولە لەفارس گەڕانەوە.

## کردەوەی تورکەکان دوای کوشتنی مەرداویج

کاتێك تورکەکان مەرداویجیان کوشت، هەڵاتن و بۆ دوو دەستە دابەش بوون. دەستەیەك لەگەڵ خەجخەج پەیوەستی عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە بوون. خەجخەج ئەو کەسەیە دواتر توزەن چاوی دەرهێنا و ئاماژەی پێدەدەین. دەستەیەك لەگەڵ بەجکەم بەرەو کوێستانەکان ڕۆشتن. ژمارەی ئەم دەستەیە زیاتر بوو. ئەوان باجی دینەوەر و ناوچەکانی دیکەیان کۆکردەوە و هێرشیان کردە سەر نەهرەوان و لەڕێگەی بەغداد، بۆ خەلیفە ڕازی نامەیەکیان نووسی. ڕازی مۆڵەتی ڕۆشتنە ناو بەغدادی پێدان و ئەوان ڕۆشتنە ناو شارەکە. سوپای حەجەرییە گومانیان دەکرد فریوێك لەئارادایە و داوایان لەخەلیفە کرد تورکەکان بۆ کوێستان بگەڕێنێتەوە. کوڕی موقلە فەرمانی گەڕانەوەی پێدان و بڕێك سامانی خستە بەردەستیان بەڵام تورکەکان ڕازی نەبوون و توڕە بوون. کوڕی موقلە چەندین نامەی بۆ نووسین و ئەوانی بۆ لای خۆی بانگ کرد. ئەو لەواست دەژیا و فەرمانڕەوایەتی بەسرەی دەکرد. تورکەکان بۆ لای کوڕی ڕائیق ڕۆشتن. کوڕی ڕائیق، بەجکەمی کردە فەرماندەی ئەوان و فەرمانی پێدا نامە بۆ هاوەڵە تورك و دەیلەمییەکانی مەرداویج بنێرێت. ئەویش نامەی بۆ نووسین و ژمارەیەك لەوان پەیوەستی بوون. کوڕی

رائیق ڕێزی گرتن و دیاری پێبەخشین. بەتایبەت چاکەی زۆری لەگەڵ بەجکەم کرد و فەرمانی پێدا هەرکات نامە بۆ کەسێك دەنووسێت خۆی بەبەجکەمی رائیقی ناو ببات. بەجکەم لای رائیق مایەوە و بەسەرهاتی ئەوان دواتر ئاماژەی پێدەدرێت.

## کاروبارەکانی وەشمگیر دوای مەرگی براکەی

کاتێك براکەی وەشمگیر کوژرا و سوپاییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا، لەڕەی مایەوە. ئەمیر نەسر کوڕی سامانی بۆ سوپاسالارەکەی خۆی لەخوراسان، محەممەد کوڕی موزەفەری موحتاج نامەی نووسی تا بەرەو قومس بڕوات. هەروەها نامەی بۆ ماکان کوڕی کالی نارد تا لەکرمانەوە پەیوەستی محەممەد کوڕی موزەفەر بێت و هەردووك بەرەو ڕەی و جورجان بەرێکەون.

ماکان لەرێگەی بیابانەوە بەرەو دامغان ڕۆشت. بانجینی دەیلەمی لەهاوەڵانی وەشمگیر لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردەسەر و ماکان لەمحەممەد کوڕی موزەفەر لەبێستام داوای هاوکاری کرد. محەممەد کوڕی موزەفەر فەرمانی بەدەستەیەکی گەورە لەسوپاکەیدا بۆ هاوکاری ماکان بەرێکەون بەڵام تا گەیشتنی خۆی نەجەنگن. سەربازەکان گوێڕایەڵی فەرمان نەبوون و جەنگیان لەگەڵ بانجین دەست پێکرد بلاّم چوونکە پشتی یەکیان نەدەگرت، شکـ ـیان خوارد و هەموویان تێکشکاو بۆ لای محەممەد کوڕی موزەفەر گەڕانەوە و ڕێکەی جورجانیان گرتەبەر. بانجیان شوێنیان کەرت بۆ ئەوەی ڕێگەیان لێ بگرێت بەڵام ئەوان ڕێگەیان بەرەو نەیشابور گۆڕی و لەوێ مانەوە و فەرمانڕەوایی ئەو شارە بەماکان کوڕی کالی سپێردرا و ماکان لەوێ مایەوە. ئەم پێشهاتە لەکۆتایی ساڵی ٩٣٥/٣٢٣ زایینی و سەرەتای ٩٣٦/٣٢٤ زایینی ڕوویدا.

کاتێك ماکان کرمانی بەجێهێشت، باوکی عەلی محەممەد کوڕی ئەلیاس بۆ کرمان گەڕایەوە و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و لەگەڵ سوپاکەی نەسر لەکرمان جەنگی و سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا. پاشماوەی گێڕانەوەکان تایبەت بەرووداوەکانی ئەوان لەساڵی ٩٣٦/٣٢٤ زایینی باس دەکەین.

## گیرانی دوو کوڕەکەی یاقوت

لەجومادی الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە رازی خەلیفە، محەممەد و موزەفەر دوو کوڕەکەی یاقوتی گرت.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەزیر، محەممەد کوڕی یاقوتی بینی کەفەرمانڕەوایی سەراسەری وڵات دەکات و خۆی بەدوور لەکاروباری فەرمانڕەوایەتی بینی، نیگەران بوو و بەردایەك خراپەی ئەوی لای خەلیفە هێنایە سەرزمان کە بەمەبەستی خۆی گەیشت.

لەپێنجی جومادی الوەل/ بیست و چواری ئاوریل هەموو سەرکردەکان وەك نەریتی هەمیشەیی هاتنە کۆشکی خەلیفە. وەزیریش هات. وای نیشاندا خەلیفە دەخوازێت چەند ناوچەیەك بەسەرکردەکان بسپێرێت. محەممەد کوڕی یاقوتیش بۆ پەردەداری لەوێ ئامادە بوو و باوکی ئیسحاقی قەراریتی، دەبیرەکەی، هاورێیەتی دەکرد. چەند کەسێك هاتنە لای محەممەد کوڕی یاقوت و ئەویان بۆ لای خەلیفە برد. بۆ ڕۆشتن بۆ لای خەلیفە پەلەی کرد. ئەویان بردە ژوورێك و لەوێ رایان گرت. دواتر قەراریتیان بانگ کرد و کاتێك هات، ئەویشیان بردە ژوورێکی دیکە. موزەفەر کوڕی یاقوتیان (کەسەرخۆش بوو) بۆ کۆشك بانگ کرد. ئەو هات و موزەفەریان زیندانی کرد.

وەزیر، باوکی عەلی کوڕی موقلە، کەسانێکی بۆ ماڵی محەممەد نارد تا رێگە لەتالأن کردنی بگرن. یاقوت لەم کاتەدا لەواست مابوویەوە. کاتێك هەواڵی گیرانی دوو کوڕەکەی بیست، بۆ جەنگی کوڕی بویە بەرەو فارس بەرێکەوت و نامەیەکی سەربەمۆری بۆ خەلیفە نووسی و داوای کرد دوو کوڕەکەی بۆ هاوکاری کردنی ڕەوانە بکات. کوڕی موقلە جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست.

## بەسەرهاتەکانی بورەیدی

لەم ساڵەدا پێگەی عەبدوللە بورەیدی بەرز بوویەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوەیە ئەو بەڵێنی کۆکردنەوەی باجی کەنارەکانی ئەهوازی دابوو. کاتێك – وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا– سوپاکەی مەرداویج دەستی بەسەر ئەهوازدا گرت و یاقوت شکستی خوارد، بورەیدی بۆ بەسرە گەڕایەوە و کەنارە دوورەکانی ئەهوازی بەڕێوەدەبرد. لەگەڵ ئەوەیشدا دەبیری یاقوت بوو. عەبدوللە پەیوەستی یاقوت بوو و لەواست مایەوە.

کاتێك دوو کوڕەکەی یاقوت دەستگیر کران، کوڕی موقلە نامەیەکی بۆ بورەیدی نووسی و فەرمانی پێدا یاقوت ئارام بکاتەوە و پێی بڵێت گرتنی کوڕەکانی لەسەر داوای سوپا بووە و دوو کوڕەکەی قۆلبەست کراون تا سوپا ئارام بگرێت و ئەم دووانە دوای ماوەیەکی دیکە بۆ پەیوەست بوون بەباوکیان ڕەوانە دەکرێن. فەرمان ئەوەیە یاقوت بۆ گرتنی فارس بەڕێکەوێت. یاقوت لەواستەوە بەرەو شوش بەڕێکەوت و بورەیدی بەکەشتی لەڕێگەی دیجلەوە بەرەو ئەهواز ڕۆشت. کۆکردنەوەی باجی شوش و جوندیشاپور لەئەستۆی دوو براکەی بورەیدی، باوکی حسەین و باوکی یوسفدا بوو. ئەم دووانە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد باجی ساڵی ٩٣٤/٣٢٢ زایینی لەلایەن مەرداویجەوە کۆکراوەتەوە و لەداهاتی ساڵی ٩٣٥/٣٢٣ زایینی شتێکی ئەوتۆ دەستنەکەوتووە چوونکە نوێنەرکانی مەرداویج ستەمیان لەخەڵکان کردووە و لەکشتوکاڵ هیچ نەماوەتەوە لەکاتێکدا بەو شێوە نەبوو (بەڵکو براکانی بورەیدی خۆیان باجەکەیان دزیبوو). کوڕی موقلە لەمە ئاگادار بوویەوە و نوێنەرێکی خۆی نارد تا لێکۆڵینەوە لەم بارودۆخە بکات. دوو براکەی بورەیدی ڕێگەی سازانیان گرتەبەر (بەرتیلیان پێدا) و نوێنەری کوڕی موقلە نووسی راستی وتەکانی ئەوانی بۆ دەرکەوتووە و بەم شێوەیە سامانێکی زۆر بەدوو براکەی بورەیدی گەیشت و پێگەیان بەرز بوویەوە. ئەو بڕەی دەستیان کەوت چوارسەد هەزار هەزار دینار بوو.

کوڕی بورەیدی داوای لەیاقوت کرد بۆ گرتنی فارس لەڕێگەی ئەرجانەوە بەڕێکەوێت و ئەو خۆی سەرقاڵی کۆکردنەوەی باجی ئەو دیارە بوو و

بەمەبەستەکەی گەیشت.

کاتێك یاقوت لەگەڵ دەستە جەنگییەکانی خۆی گەیشتە فارس، کوڕی بویە لەکەنار دەروازەی ئەرجان رووبەرووی یاقوت بوویەوە و سوپاکەی یاقوت شکستیان خوارد و دوایین کەس کەمایەوە، خۆی بوو و بەناچاری هەڵات. کوڕی بویە تا رامهورموز شوێنی کەوت. یاقوت ڕۆشتە عەسکەری موکەرەم و کوڕی بویە لەرامهورموز مایەوە تا ئاشتی لەنێوانیان سەقامگیر بوو.

## شۆڕشی حەنبەلییەکانی بەغداد

لەم ساڵەدا پێگەی حەنبەلییەکان بەرز بوویەوە تا ئەو جێگەی هێرشیان دەکردە سەر ماڵی سەرکردە و فەرماندەکان. ئەگەر شەرابیان دەبینی، دەیانڕژاند، ئەگەر گۆرانیبێژێکیان دەبینی، لێیان دەدا و کەرەستەکانی ژەنینیان بۆ دەشکاند، خۆیان لەکاروباری تایبەت بەکڕین و فرۆش هەڵدەقورتاند و ئەگەر پیاو و ژنێك و منالێك پێکەوە دەڕۆشتن، ئەگەر خزم دەبوون، پیاوەکەیان دەگرت و دەیانبردە لای فەرماندەی پاسەوانەکان و شایەتییان بۆ خراپەکاری ئەو دەدا. بارودۆخی بەغداد شلەژا.

بەدری خەرشەنی، فەرماندەی پاسەوانەکان، لەدەی جومادی الاخرە/ هەژدەی مەی سوار ئەسپ بوو و لەهەردوو لای بەغداد لەنێوان هاوەڵانی باوکی محەممەد بەربهاری جاڕیدا کەنابێت دوو حەنبەلی پێکەوە کۆببنەوە و باسی ئایینەکەی خۆیان بکەن. نابێت کەس لەوان ببێتە پێش نوێژ مەگەر ئەوەی لەنوێژەکان بەدەنگی بەرز بڵێن بسم الله الرحمان الرحیم. بەڵام ئەم وتانە کاریگەری بەجێنەهێشت و خراپەکاری و ئاژاوەگێری ئەوانی زیاتر کرد. ئەوان لەو کوێرانەی مزگەوتیان کردبووە ماڵی خۆیان، داوای هاوکارییان کرد بەجۆرێك ئەگەر کەسێکی شوێنکەوتەی شافعی لای ئەم کوێرانە گوزەری دەکرد، بەگۆچانەکەی دەستی تا سەرەمەرگ لێیان دەدا.

لەم کاتەدا نامەی رازی بۆ حەنبەلییەکان خوێندرایەوە کەسەرکۆنەی کردەوەکانی ئەوانی دەکرد و باوەڕەکانی ئەوانی لەشوبهاندن و شتەکانی دیکە

بەناڕەوا لەقەڵەم دەدا. لەم نامەدا هاتبوو: هەندێ کات گومان دەکەن روخساری قێزەون و گلاوی ئێوە هاوشێوەی پەروەردگاری جیهانە و کردەوە پەستەکانتان لەکردەوەکانی ئەو دەچێت و بۆ خواوەند، پەنجە، ئەنگوست، پێ، پیلاوی زێرین و مووی لوول و کورت دادەنێن، جارێك بۆ ئاسمان بەرزی دەکەنەوە و جارێك دەیهێننەوە سەرزەوی، خواوەند لەوەی بەستەمکار و خراپەکاری دەیهێننە سەرزمان، گەورەتر و پاکترە، سەردەمانێك پێشەوا هەڵبژێردراوەکان ناشیرین دەکەن و ناباوەڕی بۆ شیعەکانی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە و خەڵکان بەدیاردە تازەکان و ئایینە گلاوەکانتان گومڕا دەکەن لەکاتێکدا هیچ ئایەیەکی قورئانی بەڵگەی کارەکانتان نییە، ئێوە ڕێز لەزیارەتگای ئیمامەکان ناگرن و زیارەت کەران بەتۆمەتی هێنانە ئارای دیاردەی تازە سەرکۆنە دەکەن لەکاتێکدا سەردان کردنی گۆڕی کەسێکی وەك ئەحمەدی حەنبەلی کە نەشەرەف هەیە و نەرەچەڵەکی ئەو دەگاتەوە بە پێغەمبەر(د.خ)، بەڕەوا دەزانن و پێشنیار بەخەڵکان دەکەن زیارەتی گۆڕەکەی بکەن. ئەو بەکەسێکی خاوەن مۆجیزە بەخەڵکان دەناسێنن. نفرینی خواوەند لەو شەیتانەی کارە قێزەونەکانی ئەوی لەبەر چاوی ئێوەدا رازاندەوە و چەندە فریوکارە ئەو! سەروەری باوەڕداران بەهەموو شتە پیرۆزەکان سوێند دەخوات و سوێندەکەی خۆی دێنێتەدی کەئەگەر لەم ئایینە سەرکۆنە کراوەی خۆتان دەست هەڵنەگرن، تا ئەو جێگەی دەتوانێت رووبەرووتان دەبێتەوە و خوێنتان دەرێژێت و ئاوارەتان دەکات و بلاوە بەکۆبوونەوەکانتان دێنێت. دەستی بۆ شمشێر درێژە دەکات و ماڵ و سامانتان دەکاتە خۆراکی ئاگر.

## کوژرانی باوکی عەلا کوڕی حەمدان

لەم ساڵەدا ناسر ئەلدەولە باوکی محەممەد حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدان مامی باوکی عەلا کوڕی حەمدانی ڕشت.

هۆکارەکەی ئەوە بوو باوکی عەلا سەعید کوڕی حەمدان بەنهێنی بەڵێنی کۆکردنەوەی باجی موسڵ و دیاری ڕەبیعەی دابوو. ناسر ئەلدەولە، برازای ئەو، فەرمانڕەوایەتی ئەو سامانەی دەکرد. ئەو لەگەڵ پەنجا کەس لەبەغداد بەرێکەوت و وای نیشاندا دەخوازێت باجی خەلیفە لەبرازاکەی بستێنێت. کاتێك گەیشتە موسڵ، برازاکەی لەدەرەوەی شارەکە بوو. کاتێك باوکی عەلا گەیشت، ڕۆشتە کۆشکی برازاکەی و پرسیاری ئەوی کرد. وتیان: بۆ بینینی تۆ هاتووە. باوکی عەلا دانیشت و چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەوی کرد. کاتێك ناسر ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە باوکی عەلا لەکۆشکەکەی چاوەڕوانە، دەستەیەك لەکۆیلەکانی نارد. کۆیلەکان گرتیان. دواتر ناسر کەسانێکی نارد و کوشتیان.

## ڕۆشتنی کوڕی موقلە بۆ موسڵ و بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ ناسر ئەلدەولە

کاتێك ناسر ئەلدەولە، باوکی عەلای مامی کوشت و هەواڵەکەی بەخەلیفە گەیشت، کارەکەی ناسری بەقێزەون لەقەڵەمدا و فەرمانی بەکوڕی موقلەدا بەرەو موسڵ بەرێکەوێت. ئەو لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەشەعبان/ جولای ڕێگەی میسری گرتەبەر و کاتێك لەو شارە نزیك کەوتەوە، ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان لەوێ ڕۆشت و ڕووی کردە زەوزان. وەزیر تا کوێستانی تەنین شوێنی کەوت و دواتر بۆ موسڵ گەڕایەوە و لەوێ نیشتەجێ بوو و باجی کۆکردەوە.

کاتێك مانەوەی کوڕی موقلە لەموسڵ درێژەی کێشا، دەستەیەك لەهاوەڵانی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان کوڕەکەی وەزیریان فریودا. ئەو لەبەغداد جێگری وەزیر بوو. دە هەزار دیناریان پێدا تا نامەیەك بۆ باوکی بنوسێت و بۆ بەغدادی بانگ بکات. ئەو نامەیەکی بۆ باوکی نووسی و پێی وت بارودۆخی بەغداد شڵەژاوە و ئەگەر درەنگ بکات، لەو ڕووداوانەی فێرۆیی بەرهەم دێنن، ئاسوودە نابێت.

وەزیر بەم نامەیە شڵەژا و عەلی کوڕی خەلەف کوڕی تەباب و ماکەردی دەیلەمی (یەکێك لەسەربازەکانی سوپای ساجییە) لەموسڵ دانا و لەنیوەی شەوال/ هەژدەی سێپتامبەر بەرەو بەغداد بەرێکەوت.

کاتێك کوڕی موقلە موسڵی بەجێهێشت، ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان گەڕایەوە و جەنگی لەگەڵ ماکەردی دەیلەمی دەستپێکرد. کوڕی حەمدان شکستی خوارد. کوڕی حەمدان گەڕایەوە و سوپایەکی کۆکردەوە و لەزیحەجەجە/ نۆڤەمبەر دووبارە رووی کردە گۆڕەپانی جەنگ و ئەم جارە ماکەرد شکستی خوارد و بۆ رەققە هەڵات و لەوێوە رێگەی بەغدادی گرتەبەر. کوڕی تەبابیش موسڵی بەجێهێشت و کوڕی حەمدان دووبارە دەستی بەسەر موسڵ وکەنارەکانیدا گرت و نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و داوای لێکرد لەگوناحەکەی خۆش ببێت و بەڵێنیدا باجی ئەو شارە رەوانە بکات. خەلیفە بەداواکەی رازی و سەرزەمینی موسڵ ئارامی بەخۆیەوە بینی.

## گرتنی جەنوە و شارەکانی دیکە

لەم ساڵەدا قائیمی عەلەوی سوپایەکی لەئەفریقییە و لەرێگەی دەریاوە بۆ رۆم رەوانە کرد و ئەوان توانیان دەست بەسەر شاری جەنوەدا بگرن و تا سەردانییە پێشڕەوییان کرد و لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شارە رووبەروو بوونەوە و ژمارەیەکی زۆری کەشتییان سوتاند و رێگەی قرقیسایان گرتەبەر. لەوێش چەند کەشتییەکیان سووتاند و بێ زیان گەڕانەوە.

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا کاتێك خەڵکان مەبەستی حەجیان کرد و گەیشتنە قادسییە، لەدوانزەی زیقەعدە/ چواردەی ئۆکتۆبەر، باوکی تاهیری قەرەمتی ڕێگەی لێگرتن. کەس ئەوی نەناسییەوە و سوپای خەلیفە ڕووبەڕووی بوونەوە و حاجییەکانیش هاوکارییان کرد. قەرەمتییەکان پەنایان بۆ قادسییە برد. دەستەیەك لەعەلەوییەکانی کوفە ڕۆشتنە لای باوکی تاهیر و داوایان لێکرد دەست لەحاجییەکان هەڵگرێت. ئەو دەستی لەحاجییەکان هەڵگرت بەو مەرجەی هەموویان بۆ بەغداد بگەڕێنەوە. حاجییەکان بۆ بەغداد گەڕانەوە و لەم ساڵەدا کەس لەخەڵکانی بەغداد حەجی نەکرد و باوکی تاهیر ڕێگەی کوفەی گرتەبەر و چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە. دواتر کوفەی بەجێهێشت و ڕۆشت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەموحەرەم/ دێسامبەری ئەم ساڵە، ڕازی دوو کەنارەی ڕۆژئاوا وڕۆژهەلاتی بەدوو کوڕەکەی خۆی باوکی جەعفەر و باوکی فەزڵ سپارد و ئەم فەرمانەی بۆ هەموو سەرزەمینەکان نووسی.

لەشەوی دوانزەی زیقەعدە/ چواردەی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە، ئەو شەوەی قەرەمتی ڕێگەی لەحاجییەکان گرت، لەسەرەتای شەو تا کۆتایی، نەیزەك لەئاسمان دەباری کەهاوشێوەی نەبینراوە.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی یاقوت لەزیندان بەهۆی خوێنبەربوونەوە مرد و شایەت و قازییەکانیان هێنا و جەستەی بێ گیانی ئەبوبەکریان نیشاندا و ئەوان هیچ شوێنەوارێکی ئەشکەنجە یا خنکانیان نەبینی. ئەوان قژی سەریان ڕاکێشا بۆ ئەوەی لەژەهر خوارد کردنی دڵنیا بن. جەنازەکەیان بۆ بنەماڵەکەی گەڕاندەوە. سامان، زەوی، کارگوزاران و هەرکەسێك کەیەنی و بەیەنی لەگەڵ ئەودا بوو، گیرا.

لەم ساڵەدا لەخوراسان گرانی هاتە ئاراوە بەشێوەیەك ژمارەیەکی زۆر

لەدانیشتوانەکەی لەبرسا مردن. ژمارەکەیان بەئەندازەیەك بوو خەڵکان لەبەخاك سپاردنی ئەوان ناتەوان بوون. خەڵك، هەژار و دەست کورتەکانیان لەماڵێکدا کۆدەکردەوە تا ئەو کاتەی کفن و کەرەستەکانی بەخاك سپاردنی ئەوان ئامادە دەکرا.،

لەم ساڵەدا عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە، ڕۆکن ئەلدەولەی برای بۆ کێوەکان ڕەوانە کرد و دوای گەڕانەوەی ئەو لەکاتی مەرگی مەرداویج، سوپایەکی کردە هاوڕێی. ئەو ڕوویکردە ئیسفەهان و دەستی بەسەردا گرت و نوێنەرەکانی وەشمگیری لەئیسفەهان و چەند شارێکی چیا دەرپەڕاند. وەشمگیر سوپای رازاندەوە و بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. ڕۆکن ئەلدەولە، لەسەر شارەکانی ئیسفەهان، هەمەدان، قوم، کاشان، کەرەج، رەی، کەنکور، قەزوێن و.... دەجەنگا.

لەکۆتایی جومادی الاخرە/ هەشتی جونی ئەم ساڵە، سوپا لەبەغداد شۆڕشی کردو مەبەستی هێرش کردنە سەر ماڵی عەلی کوڕی موقلە و کوڕەکەی ئەویان کرد. شۆڕشی ئەوان تەشەنەی کرد و هاوەڵانی کوڕی موقلە رێگەیان لێگرتن. شۆڕشییەکان بیریان لەرێگە چارە کردەوە و لەپشتەوە تونێلێکیان بۆ ماڵی وەزیر لێدا و ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی و دەستیان بەسەردا گرت. وەزیر و کوڕەکەی بەرەو رۆژئاوا هەڵاتن. کاتێك سوپای ساجییە لەم شۆڕشە ئاگادار بوویەوە، سوار لەسەر ئەسپ رێگەی ماڵی وەزیریان گرتەبەر و شۆڕشگێرانیان ئارام کردەوە و وەزیر و کوڕەکەیان بۆ ماڵەکەی گەڕاندەوە.

وەزیر بەدوای ئەم شۆڕشە گومانی لەدەستەیەك لەهاوەڵانی کوڕی یاقوت کرد و فەرمانیدا جاڕ بدەن کەس لەوان لەمەدینە ئەلسەلام نەمێنێتەوە. سوپا جارێکی دیکە لەیانزەی زیحەججە/ دوانزەی نۆڤەمبەر کەوتنە جموجۆڵ و چەندین تونێلیان بۆ ماڵی وەزیر لێدا. کۆیلەکانی وەزیر رێگەیان لێگرتن و ڕووبەڕوویان بوونەوە. فەرماندەی پاسەوانەکان پارێزگاری لەزیندان دەکرد بۆ ئەوەی کەس دەرگای زیندان نەکاتەوە. شۆڕش دامرکایەوە.

لەم ساڵەدا بەنێوەنجیگەری کوڕی موقلەی وەزیر، موزەفەر کوڕی یاقوت لەزیندانی خەلیفە رزگاری بوو و سوێندی خوارد ببێتە هاوڕێی وەزیر و رێگەی

ناسازگاری ئەو نەگرێتەبەر و هیچ کات خراپەی وەزیر وکوڕەکەی نەهێنێتە سەرزمان. بەڵام ئەم پەیمانەی نەبردەسەر نەبۆ خۆی نەبۆ کوڕەکەی و لەگەڵ سوپای حەجەرییە دژی ئەو یەکیان گرت و دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ ئەو ئاشکرا کرد.

موزەفەر ڕقی وەزیری لەدڵدا بوو چوونکە گومانی دەکرد براکەی ژەهر خوارد کردووە و کوشتوویەتی.

لەم ساڵەدا کوڕی موقلە چەندین نێردراوی بۆ لای محەممەد کوڕی رائیق ناردە واست. ئەو ڕێگەی لەخواردەمەنییانە گرتبوو کەبۆ خەلیفە دەنێردرا. خەلیفەیش داوای ماڵیاتی واست و بەسرە و شارەکانی نێوان ئەم دوو شارەی لێدەکرد. محەممەد کوڕی رائیق ڕێزی لەنێردراوەکان گرت و- لەبەر نەزانی- نامەیەکی بۆ کوڕی موقلە نووسی و بەشێوەیەکی نهێنی نامەیەکی بۆ خەلیفە نارد. ئەو لەم نامەدا نووسیبووی ئەگەر خەلیفە ئەو بانگ بکات و کاروبارەکان بەو بسپێرێت.و بەڕێوەبردنی حکومەت بخاتە ئەستۆی ئەو، دەتوانێت هەموو خەرجییەکانی خەلیفە و ڕۆژانەی سوپا دابین بکات. کاتێك نامەکەی بەدەستی خەلیفە گەیشت، وەڵامی نەدایەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدویە کوڕی سەدوسی هوزەلی لەمناڵەکانی عوتەبە کوڕی مەسعود لەکوفە مرد. ئەو خەڵکی نەیشابور بوو. ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەرەفە ناسراو بەنەفتویەی نەحوی کەچەندین نوسراوی هەیە، لەم ساڵەدا کۆچی دوای کرد. ئەو یەکێك لەمناڵەکانی موهەلیب کوڕی باوکی سوفرە بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و چواری کۆچی ( ٩٣٦ زایینی )

## گرتنی کوڕی موقلە و وەزارەتی عەبدولرەحمان کوڕی عیسا

کاتێك نێردراوەکان بێ پارە لای کوڕی رائیق گەڕانەوە، وەزیر بەباشی زانی کوڕەکەی بۆ لای ئەو بنێرێت. سوپایەکی بۆ ئەو ئامادە کرد و وای نیشاندا مەبەستی ئەهوازی لەسەردایە. لەنیوەی جومادی الاوەل/ دوانزەی ئاوریل، وەزیر ڕۆشتە کۆشکی رازی. ئەو بەخەلیفەی وت مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەهوازی هەیە تا خەلیفە پەرێشان نەبێت. نوێنەرێکی بۆ لای کوڕی رائیق نارد تا لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەم سوپایە نەبێتە هۆی راچڵەمینی ئەو. کاتێك کوڕی موقلە بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە، موزەفەر کوڕی یاقوت و سوپای حەجەرییە ئەویان گرت. موزەفەر– وەك ئاماژەی پێدرا– لەزیندان ئازاد کرابوو.

ئەوان کەسانێکیان بۆ لای رازی نارد و لەکارەکەی خۆیان ئاگاداریان کردەوە. رازی کارەکەی ئەوانی پەسەند کرد. باوکی حسەین کوڕی باوکی عەلی کوڕی موقلە و مناڵەکان و ئەندامانی خێزان و هاوەڵانی ئەو خۆیان شاردەوە. سوپاکەی حەجەرییە و ساجییە داوایان لەرازی کرد، وەزیرێك دەستنیشان بکات. رازی ئەو کارەی خستە ئەستۆی خۆیان و ئەوان عەلی کوڕی عیسایان هەڵبژارد. رازی بۆ سپاردنی وەزارەت ئەوی بانگ کرد بەڵام عەلی کو ، عیسا رازی نەبوو و عەبدولرەحمانی برای بۆ ئەو کارە پەسەند کرد. رازی، کوڕی موقلەی بە عەبدولرەحمان سپارد و عەبدولرەحمان سامانەکەی زەوت کرد و بەدری خەرشەنی لەفەرماندەیی پاسەوانەکان لابرد بەڵام عەبدولرەحمان بۆ بەرێوەبردنی کارەکان ناتەوان بوو و دەستی لەکار کێشایەوە.

ناسازگاری ئەو نەگرێتەبەر و هیچ کات خراپەی وەزیر وکوڕەکەی نەهێنێتە سەرزمان. بەڵام ئەم پەیمانەی نەبردەسەر نەبۆ خۆی نەبۆ کوڕەکەی و لەگەڵ سوپای حەجەرییە دژی ئەو یەکیان گرت و دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ ئەو ئاشکرا کرد.

موزەفەر ڕقی وەزیری لەدڵدا بوو چوونکە گومانی دەکرد براکەی ژەهر خوارد کردووە و کوشتوویەتی.

لەم ساڵەدا کوڕی موقلە چەندین نێردراوی بۆ لای محەممەد کوڕی رائیق ناردە واست. ئەو ڕێگەی لەخواردەمەنییانە گرتبوو کەبۆ خەلیفە دەنێردرا. خەلیفەیش داوای ماڵیاتی واست و بەسرە و شارەکانی نێوان ئەم دوو شارەی لێدەکرد. محەممەد کوڕی رائیق ڕێزی لەنێردراوەکان گرت و- لەبەر نەزانی- نامەیەکی بۆ کوڕی موقلە نووسی و بەشێوەیەکی نهێنی نامەیەکی بۆ خەلیفە نارد. ئەو لەم نامەدا نووسیبووی ئەگەر خەلیفە ئەو بانگ بکات و کاروبارەکان بەو بسپێرێت.و بەڕێوەبردنی حکومەت بخاتە ئەستۆی ئەو، دەتوانێت هەموو خەرجییەکانی خەلیفە و رۆژانەی سوپا دابین بکات. کاتێك نامەکەی بەدەستی خەلیفە گەیشت، وەڵامی نەدایەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدویە کوڕی سەدوسی هوزەلی لەمناڵەکانی عوتەبە کوڕی مەسعود لەکوفە مرد. ئەو خەڵکی نەیشابور بوو. ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی عەرەفە ناسراو بەنەفتویەی نەحوی کەچەندین نوسراوی هەیە، لەم ساڵەدا کۆچی دوای کرد. ئەو یەکێك لەمناڵەکانی موهەلیب کوڕی باوکی سوفرە بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و چواری کۆچی ( ٩٣٦ زایینی )

## گرتنی کوڕی موقلە و وەزارەتی عەبدولڕەحمان کوڕی عیسا

کاتێك نێردراوەکان بێ پارە لای کوڕی ڕائیق گەڕانەوە، وەزیر بەباشی زانی کوڕەکەی بۆ لای ئەو بنێرێت. سوپایەکی بۆ ئەو ئامادە کرد و وای نیشاندا مەبەستی ئەهوازی لەسەردایە. لەنیوەی جومادی الاوەل/ دوانزەی ئاوریل، وەزیر ڕۆشتە کۆشکی ڕازی. ئەو بەخەلیفەی وت مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەهوازی هەیە تا خەلیفە پەرێشان نەبێت. نوێنەرێکی بۆ لای کوڕی ڕائیق نارد تا لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەم سوپایە نەبێتە هۆی ڕاچڵەمینی ئەو. کاتێك کوڕی موقلە بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە، موزەفەر کوڕی یاقوت و سوپای حەجەرییە ئەویان گرت. موزەفەر– وەك ئاماژەی پێدرا– لەزیندان ئازاد کرابوو.

ئەوان کەسانێکیان بۆ لای ڕازی نارد و لەکارەکەی خۆیان ئاگاداریان کردەوە. ڕازی کارەکەی ئەوانی پەسەند کرد. باوکی حسەین کوڕی باوکی عەلی کوڕی موقلە و مناڵەکان و ئەندامانی خێزان و هاوەڵانی ئەو خۆیان شاردەوە. سوپاکەی حەجەرییە و ساجییە داوایان لەڕازی کرد، وەزیرێك دەستنیشان بکات. ڕازی ئەو کارەی خستە ئەستۆی خۆیان و ئەوان عەلی کوڕی عیسایان هەڵبژارد. ڕازی بۆ سپاردنی وەزارەت ئەوی بانگ کرد بەڵام عەلی کو ، عیسا ڕازی نەبوو و عەبدولڕەحمانی برای بۆ ئەو کارە پەسەند کرد. ڕازی، کوڕی موقلەی بە عەبدولڕەحمان سپارد و عەبدولڕەحمان سامانەکەی زەوت کرد و بەدری خەرشەنی لەفەرماندەیی پاسەوانەکان لابرد بەڵام عەبدولڕەحمان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان ناتەوان بوو و دەستی لەکار کێشایەوە.

## گرتنی عەبدولرەحمان و وەزارەتی باوکی جەعفەری کەرخی

کاتێك ناتەوانی عەبدولرەحمان بۆ رازی ئاشکرا بوو، ئەو و براکەی عەلی کوڕی عیسای گرت. رازی لەعەلی کوڕی عیسا سەد هەزار دینار و لە عەبدولرەحمانی برای حەفتا هەزار دیناری سەند.

## چۆنیەتی کوژرانی یاقوت

لەم ساڵەدا یاقوت لەعەسکەر موکەرەم کوژرا.

چۆنیەتی کوژرانەکەی بەم شێوەیە بوو. باوکی عەبدوللەی بورەیدی بەکەسێکی بڕواپێکراوی خۆی دەزانی. بورەیدی فێڵی لێکرد و چاکەکاری ئەوی بەخراپەکاری وەڵام دایەوە و باسی چۆنیەتی ئەم کارە دەکەین.

پێشتر وتمان باوکی عەبدولله نامەیەکی بۆ یاقوت نووسی و بەڵێنی کۆکردنەوەی باجی ئەهوازیدا. یاقوت ئەوی بەکەسێکی بڕواپێکراو لەقەڵەمدا و وتەکانی ئەوی پشتراست کردەوە. هەرکات هەواڵێکی باوکی عەبدوللەیان دەبردە لای یاقوت و لەخراپەکاری ئەو ئاگاداریان دەکردەوە، یاقوت دەیوت: باوکی عەبدولله بەو شێوەیە نییە کەئێوە گومانی دەکەن. چوونکە هەرگیز ئارەزووی فەرمانڕەوایەتی و فەرماندەیی سوپاییەکانی لەسەردا نییە و پسپۆری ئەو دەبیرییە. بەم شێوەیە فریوی ئەوی خوارد.

یاقوت، پیاوێکی چاکەکار و خۆش باوەڕ بوو. لەبەر ئەمە کاتێك خەلیفە دوو کوڕەکەی گرت، سەرپێچی فەرمانەکانی نەکرد و لەسەر بەڵێن و پەیمانەکەی خۆی مایەوە.

بەڵام بارودۆخی ئەو لەگەڵ بورەیدی بەم شێوە بوو. کاتێك یاقوت لە عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە شکستی خوارد و بەرەو عەسکەر موکەرەم هەڵات، باوکی عەبدوللەی بورەیدی نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێکرد لەعەسکەر موکەرەم بمێنێتەوە و کەمێك وچان بگرێت تا بیر لەرێگە چارەیەك بکەنەوە. باوکی عەبدولله لەو کاتەدا لەئەهواز بوو. حەزی نەدەکرد لەگەڵ یاقوت لەشارێکدا بمێنێتەوە.

یاقوت گوێی لەقسەکانی باوکی عەبدوللە گرت و لەعەسکەر موکەرەم ئوردووی لێدا. باوکی عەبدوللە، براکەی خۆی باوکی یوسفی بورەیدی بۆ لای یاقوت نارد تا دڵنەوایی بکات و تەندروستی ئەو پێش هەموو شتێك بخات. فەرمانی پێدا پەنجا هەزار دینار لەئەهوازەوە بۆ یاقوت ببات چوونکە یاقوت سوپایەکی لەتیرەکانی بەربەر، شەفیعیە، نازوکیە، بولەیقیە و هارونیەی لەگەڵدا بوو. کوری موقلە ئەم سوپاییانەی (شوێنکەوتەکانی بولەیقیە، نازوك و هارون کوری غەریبی) لەسوپاکەی بەغداد .جیاکردبوویەوە و رەوانەی ئەهوازی کرد تا خەرجییەکانیان کەم ببێتەوە. باوکی یوسف بەیاقوتی وت: ئەم دەستەیە ئەگەر ببینن ئەم پارەیە بەدەستی تۆ دەگات، شۆرش دەکەن و باوکی عەبدوللە ناچار دەبێت ئەهواز بەجێبێڵێت و پەیوەستی تۆ بێت و نازانین دەرئەنجامی ئەم کارە بەکوێ دەگات. ئەوسا وتی: پیاوەکانی تۆ بەو ئەزمونە خراپەی لەخۆیان نیشانیاندا، بەکەم رازی دەبن.

یاقوت بەقسەکانی باوکی یوسف رازی و پارەکەی وەرگرت و لەناو هاوەڵانی خۆی دابەشی کرد. چەند مانگێك مایەوە بێ ئەوەی هیچ لەو برە پارەیە بۆ خۆی هەڵگرێت تا ئەوەی ساڵی ٩٣٦/٣٢٤ زایینی دەستپێکرد. سوپاکەی یاقوت لەکەمی بژێوی کەوتنە تەنگانەوە و دەنگیان بەرز کردەوە و باسی هاوەڵانی بورەیدیان لەئەهواز کرد کە بەئاسوودەی ژیان بەسەر دەبەن.

لەم کاتەدا تاهیری جیلی(گیلانی) لەهاوەڵە نزیک ـی کوری بویە، لەگەڵ هەشتسەد سوار پەیوەستی یاقوت بوو. تاهیر پێگەیەکی بەرزی بوو کەخۆی بۆ لەئەستۆ گرتنی کارە گەورەکان بەشیاو دەزانی.

هۆکاری پەیوەست بوونی تاهیر بەیاقوت ئەوە بوو دەترسا لەوەی نەکان کوری بویە لەسەر بنەمای ترسی گوماناوی خۆی لەو (تاهیر) قۆلبەستی بکات. تاهیر کاتێك بارودۆخی یاقوتی بینی، لێی جیابوویەوە و رێگەی رۆژئاوای شوشتەری گرتەبەر. ئەو دەیویست دەست بەسەر ماهی بەسرەدا بگرێت. دەبیرەکەی، باوکی جەعفەری سەیمەری، هاورێیەتی دەکرد. کوری بویە لەم پێشهاتە ئاگادار و تاهیری سەرکوت کرد و تاهیر و سوپاکەی هەڵاتن و کوری بویە دەستی بەسەر خۆی و

سوپاکەیدا گرت و سامانەکانی تالآن و سەیمەری ئەسیر کرد بەلآم خەیات، وەزیری عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە، ئەوی رزگار کرد. سەیمەری ڕۆشتە کرمان و پەیوەستی مۆعیزئەلدەولە باوکی حەسەن کوڕی بویە بوو. ئەم پەیوەست بوونە دەرئەنجامێکی باشی لێکەوتەوە.

کاتێك تاهیر، یاقوتی بەجێهێشت، یاقوت، ورەی لەدەستدا و سوپاکەی بوێر بوون و یاقوت لێیان ترسا. نامەیەکی بۆ بورەیدی نووسی و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری کردەوە و پێی وت تەنیا بڕوای بەرێگەچارەکانی ئەو هەیە. بوەریدی پەیامی بۆ نارد: سوپاکەی تۆ لەناو چووە، باشترە ئەوان بۆ لای من ڕەوانە بکەیت تا بارودۆخی ئەوان سامان بدەن. خۆی بەئەندازەیەك گرفتارە ناتوانێت بڕواتە لای یاقوت و ئەگەر لەگەڵ سوپاکەی بڕواتە لایان، ناتوانێت دادی یاقوت لەوان وەربگرێت چوونکە ئەگەری هەیە سوپاییەکان پشتیوانی لەیەك بکەن بەلآم ئەگەر دەستە دەستە بەرەو ئەهواز بەرێکەون، دەتوانێت بەو شێوەی دەخوازێت مامڵەیان لەگەڵ بکات و ئەوان دەرفەتی ناسازگارییان دەست ناکەوێت.

یاقوت ئەو کارەی کرد و سوپاکەی خۆی بۆ لای بورەیدی ڕەوانە کرد. بورەیدی سەربازە شیاوەکانی بۆ خۆی هەڵبژارد و سەربازە نەشیاوەکانی بۆ لای یاقوت گەڕاندەوە. بورەیدی رۆژانەی سەربازە نەشیاوەکانی بڕی. یاقوتیان لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە و داوایان لێکرد پێش ئەوەی باوکی عەبدولله جڵەوی کاروبارەکان بگرێتە دەست، لەناوی ببات. یاقوت گرنگی بەوتەکانی ئەوان نەدا و وتی: من ئەو سەربازانەم لای ئەو کردۆتە هێزی پشتیوانی خۆم.

بورەیدی چاکەی لەگەڵ سەربازەکانی خۆی کرد. هاوەڵانی یاقوت ئەمەیان پێ وت و داوای ئەو رۆژانەیان کرد کەبورەیدی بۆی دیاریکردبوون. یاقوت نامەیەکی بۆ بورەیدی نووسی بەلآم بورەیدی هیچی نەنارد. یاقوت دووبارە نامەیەکی نووسی و بوەریدی هیچی نەنارد. یاقوت بێ کەرەستەی جەنگ بۆ لای بورەیدی بەرێکەوت تا لێی نەترسێت. کاتێك هەواڵی هاتنی یاقوت بەبوەریدی گەیشت، بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشت و دەستی ماچ کرد و ئەوی بردەماڵەکەی خۆی و خۆی بەدەستی خۆی خواردنی بۆ دەهێنا و خزمەتی دەکرد.

بورەیدی سەربازەکانی بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش ئامادە کردبوو. سەربازەکان لەبەردەم ماڵەکەی کۆبوونەوە و دەنگیان بەرز کردەوە و داوای دادپەروەرییان دەکرد. یاقوت پرسیاری ئەم بارودۆخەی کرد. پێیان وت: سەربازەکانن و لەبەر دەرگا دەنگە دەنگیان دروست کردووە و دەڵێن یاقوت و بورەیدی رێککەوتوون و ئێمە دەبێت یاقوت بکوژین. بورەیدی پێی وت: دەبینی چیمان بەسەر هاتووە، کەواتە گیانی خۆت رزگار بکە وەگەرنە هەموومان دەکوژرێین. یاقوت هەراسان و نیگەران لەدەرگایەکی دیکەوە ڕۆشتەدەر و بورەیدی هیچی بەکەس نەوت. یاقوت بۆ عەسکەر موکەرەم گەڕایەوە. بورەیدی نامەیەکی بۆ نووسی: هەوڵی زۆرمدا بۆ ئەوەی سەربازەکان ئارام بکەمەوە بەلام نەمتوانی و لەوەی مەبەستی کوشتنی تۆ بکەن، ئاسوودە نیم. دووری عەسکەر موکەرەم لەئەهواز زیاتر لەهەشت فەرسەنگ نییە و باشتر وایە بەرەو شوشتەر بڕۆیت تا لەم دەستەیە دوورتر بیت چوونکە لەوێ باشتر دەتوانیت بەرگری بکەیت. ئەو نامەیەکی بۆ کارگوزارەکەی خۆی لەشوشتەر نووسی تا پەنجا هەزار دینار بەیاقوت بدات.

یاقوت بەرەو شوشتەر بەرێکەوت. ئەو کۆیلەیەکی هەبوو بەناوی مونس. رۆژێك بەیاقوتی وت: ئەی ئەمیر، بورەیدی، بەندەکانی ئێمەی پچڕاندووە و ئەو بەلامان بەسەر دێنێت کەدەیبینی وتۆ فریوت خوارد. ئەو خۆی سەربازەکانی ئەهوازی ناچار کرد دەنگە دەنگ بکەن و دوای ئەوەی هاوەڵە شازەکانی تۆی هەڵبژارد، تۆی بۆ شوێنێکی دوور ڕەوانە کرد و پارەیەکی بۆ تۆ نارد کەتەنانەت ناتوانی نیازەکانی خۆتی پێ دابین بکەیت و تەنیا دەتوانی خۆت بگەیێنێتە ناوچەیەك. هەنووکە رۆژانەی ئێمە کەمی کردووە و چوارپێ و ئالیکمان نەماوە. لەم کاتەیشدا ئێمە ناچار دەبین لەخراپترین دۆخدا بەجێت بێڵین و بورەیدی بەم شێوەیە بەمەبەستی خۆی دەگات. خۆت لەو بپارێزە. سوپای حەجەرییە لەبەغداد جگە لەتۆ کەس بەبڕواپێکراو نازانن، نامەیشیان بۆ نووسیویت، بۆ لای ئەوان بەرێکەوە چوونکە هەر کەسێك لەبەغداد بێت، بەرێبەری تۆ رازی دەبێت. ئەگەر ئەو کارە دەکەیت، چ باشتر، وەگەرنە ئێمە بۆ ئەهواز ببە تا بورەیدی لەوی دەربپەڕێنین هەرچەندە پێگەی ئەو لەئێمە بەهێزترە بەلام تۆ ئەمیریت و ئەو دەبیر.

یاقوت وتی: سەبارەت بەباوکی عەبدوللە بەم شێوەیە قسە مەکە چوونکە ئەگەر برایەکم دەبوو زیاتر لەو چاکەی لەگەڵ من نەدەکرد.

لەمە دوا ئەو کار و کردەوانە لەیاقوت بینرا کەبەڵگەی ناتەوانی و لاوازی ئەو لەبەرابەر بورەیدی بوو. بەم شێوەیە هاوەڵانی ورەی خۆیان دۆڕاند و هەر شەو دەستەیەك لەوان بەنهێنی پەیوەستی یاقوت دەبوو. هەرکات یاقوتیان لەم پێشهاتە ئاگادار دەکردەوە، دەیوت: ترسم نییە چوونکە پەیوەستی دەبیرەکەم دەبن. بەرادیەك پیاوەکانی ئەمی کرد کەتەنیا خۆی و هەشتسەد پیاو مانەوە.

لەم کاتەدا رازی لەجومادی الاوەل/ مارس، موزەفەر کوڕی یاقوتی بۆ ماوەی حەفتەیەك زیندانی کرد، دواتر ئەوی لەزیندان هێنایەدەر و بۆ لای باوکی نارد. کاتێك موزەفەر گەیشتە لای باوك، داوای لێکرد بەرەو بەغداد بڕوات و پێی وت ئەگەر ئەو کارە بکات، بەهەموو ویست و مەبەستەکانی دەگات وگەرنە دەبێت رێگەی موسڵ و دیاری رەبیعە بگرێتەبەر و دەست بەسەر ئەو سەرزەمینەدا بگرێت بەڵام یاقوت گرنگی بەوتەکانی کوڕەکەی نەدا و بەم شێوەیە موزەفەر پەیوەستی بورەیدی بوو. بورەیدی رێزی گرت و چەند کەسێکی بۆ چاودێری کردنی ئەو راسپارد.

لەم کاتەدا بورەیدی لەهاوەڵانی یاقوت ترسا نەکا پەیوەستی یاقوت ببن و خۆشەویستی ئەو لەدڵدا پەروەردە بکەن و بەم شێوەیە ئەوەی رستوویەتی، ببێتەوە بەخوری. بۆ ئەمە مەبەستە نێردراوی بۆ لای یاقوت نارد: خەلیفە نامەیەکی بۆ ناردووم و فەرمانی پێداوم رێگە نەدەم لەوێ بمێنیتەوە، منیش توانای ناسازگاری کردنی خەلیفەم نییە، خەلیفە فەرمانی پێداوم داوا لەتۆ بکەم لەگەڵ پانزە کۆیلە بڕۆیتە بارەگاکەی یا رێگەی چیاکان بگریتەبەر بۆ ئەوەی چەند ناوچەیەك بخاتە ژێر فەرمانی تۆ. ئەگەر گوێرایەڵی فەرمانەکان بیت چ باشتر وگەرنە ناچار دەبم بەزۆر ناچارت بکەم.

کاتێك ئەم نامەیە بەدەستی یاقوت گەیشت، سەرگەردان بوو، راوێژی لەگەڵ مونسی کۆیلەی کرد. مونس وتی: من تۆم لەبورەیدی ئاگادار کردەوە و تۆ گوێت لەوتەکانی من نەگرت و چیتر دەرفەتی راوێژ کردن نەماوە. یاقوت نامەیەکی بۆ

بورەیدی نووسی و داوای یەك مانگ مۆڵەتی لێکرد تا بۆ ڕۆشتن خۆی ئامادە بکات. لەم کاتەدا هەستی بەخراپەکاری بوەریدی کردبوو بەڵام چیتر سوودی پێنەدەگەیاند.

کاتێك نامەکەی یاقوت بەدەستی بورەیدی گەیشت، بەپێشنیارەکەی رازی نەبوو و سوپاکەی لەئەهوازەوە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. یاقوت چەندین سیخوڕی دانا تا لەهەواڵ و پێشهاتەکان ئاگاداری بکەنەوە. بورەیدی یەکێك لەسیخوڕەکانی گرت و پارەی پێدا تا بەیاقوت بڵێت بوەریدی و سوپاکەی گەیشتوونەتە عەسکەر موکەرەم و بەئاسوودەیی لەناو ماڵەکانی ئەوێ دابەزیون. سیخوڕ هات و ئەم هەواڵەی بەیاقوت گەیاند. یاقوت مونسی بانگ کرد و پێی وت: بەسەر ئەو دوژمن ناسوپاسەدا سەرکەوتین و مونسی لەهەواڵەکە ئاگادار کردەوە و وتی: شەوانە لەشوشتەرەوە بەرەو عەسکەر موکەرەم دەڕۆین و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش دەکەینە سەر ماڵەکانیان و سەکوتیان دەکەین. ئەگەر بورەیدی گرفتار بوو، سپاسی خواوەند بەجێ دێنین و ئەگەر هەڵات شوێنپێی هەڵدەگرین.

مونس وتی: ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێت و سیخوڕەکە راستی وتبێت، زۆر باشە! یاقوت وتی: سیخوڕ منی خۆش دەوێت و یەکێکە لەشوێنکەوتەکانی من و کەسێکی راستگۆیە. یاقوت بەرێکەوت و بەرەبەیان گەیشتە عەسکەر موکەرەم بەڵام سوپاکەی بورەیدی لەوێ نەبینی. ئەو لەشارەکە گوزەری کرد و گەیشتە رووباری جارود و لەکەنار رووبارەکە خێوەتی هەڵدا. یەك رۆژ لەوێ مایەوە بەڵام هیچ نیشانێکی لەسوپاکەی بورەیدی نەبینی. مونس وتی: سیخوڕ درۆی لەگەڵ کردووین و تۆ بەردەوام گوێ لەوتەی درۆزنەکان دەگرین و من بۆ گیانی تۆ دەترسم.

کاتێك هەتاو لەئاوا بوون نزیك کەوتەوە، سوپاکەی بورەیدی دەرکەوتن و لەیەك فەرسەنگی یاقوت ئوردوویان لێدا. شەو جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد. لەبەرەبەیاندا شەڕ و پێکدادان لەنێوان دوو سوپا روویدا بەڵام هەردوو سوپا بۆ جەنگ لەبەیانی ئەو رۆژە خۆیان ئامادە کرد.

بورەیدی سوپایەکی دیکەی لەرێگەیەکیترەوە ڕەوانە کردبوو تا بێ ئەوەی یاقوت بزانێت لەپشتەوە هێرشی بکەنەسەر. ئەم سوپایە بۆسەی نابوویەوە و چاوەڕوانی دەستپێکردنی جەنگ بوون. کاتێك ئاگری جەنگ هەڵگیرسا، هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و لەبەرەبەیان تا نیمەڕۆ شمشێریان وەشاند. سوپای بورەیدی لەگەڵ ئەوەی ژمارەیان زیاتر و تەیارتر بوون، شکستیان خوارد. باوکی جەعفەری حەماڵ فەرماندەی ئەم سوپایە بوو. لەنیمەڕۆدا سوپاکەی دیکە لەپشتەوە هێرشیان کردە سەر یاقوت. یاقوت، مونسی لەگەڵ سێسەد سەرباز بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد. مونس ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرئەنجام شکستی خوارد و بەم شێوەیە سوپاکەی یاقوت کەژمارەیان لەپێنسەد تێپەڕی نەدەکرد، هەڵاتن. کاتێك یاقوت ئەمەی بینی، لەئەسپەکەی دابەزی و شمشێرەکەی فڕێدا و بەجلەکانی بەری لای دیواری کاروان سەرایەك دانیشت. ئەگەر دەڕۆشتە ناو کاروان سەراکە و خۆی دەشاردەوە، کەس نەیدەدۆزییەوە و ئەگەر تا شەو لەشوێنەکەی دەمایەوە، زیانی پێنەدەگەیشت بەڵام خواوەند مەبەستەکانی خۆی دێنێتەدی و هۆکارەکانی ئامادە دەکات.

کاتێك لای دیوارەکە دانیشت، بەقۆڵی کراسەکەی ڕوخساری خۆی داپۆشی و دەستی هاوشێوەی سواڵکەرەکان درێژ کرد. دەستەیەك لەسوپاکەی بورەیدی لای ئەو گوزەریان کرد و نەیانناسییەوە. فەرمانیان پێدا ڕوخساری خۆی نیشان بدات بەڵام یاقوت ئەو کارەی نەکرد. یەکێك لەوان بەزوبین لەجەستەیدا و یاقوت ڕوخساری ئاشکرا کرد و وتی: من یاقوتم، چیتان دەوێت؟ من بۆ لای بورەیدی ببەن. ئەو دەستەیە پەلاماریاندا و کوشتیان و سەری یاقوتیان بۆ ئوردووگا ڕەوانە کرد. باوکی جەعفەری حەماڵ بەباڵندەیەکی نامەبەر ئەم هەواڵی بۆ بورەیدی نووسی و داوای مۆڵەتی کرد تا سەری یاقوت بباتە بارەگاکەی. بورەیدی وەڵامی ناردەوە کەسەری بگێڕنەوە بۆ لای جەنازەکەی و کفنی بکەن و بەخاکی بسپێرن. کۆیلەی یاقوت، مونس و سەرکردەکانی دیکە ئەسیر کران و کوژران. بورەیدی نوێنەرێکی بۆ شوشتەر نارد وئەو، هەموو سامانەکانی یاقوت لەکەنیز و پارەی بۆ لای بورەیدی برد. تەنیا دوانزە هەزار دیناریان لەیاقوت بەدەست هێنا. بورەیدی،

موزەفەر کوڕی یاقوتی گرت و ئەو بۆ ماوەیەك لەزیندانی بورەیدی مایەوە. دواتر بورەیدی ئەوی ڕەوانەی بەغداد کرد.

بورەیدی دوای کوشتنی یاقوت ستەمکاری و زۆرداری کردە پیشە. ئێمە بەشێوەیەکی بەرفراوان ئاماژەمان بەم گێڕانەوەیەدا چوونکە ئەو خاڵانەی تیا بەدی دەکرێت کەمرۆڤ بۆ وشیاری و خۆپارێزی هان دەدات و لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئەو ئەزمون و ئامۆژیاریانەی تیایە کە لەژیانی مرۆڤەکان زۆر دووبارە دەبنەوە.

## لابردنی باوکی جەعفەر و وەزارەتی سلێمان کوڕی حەسەن

کاتێك- ئاماژەی پێدرا - باوکی جەعفەری کەرخی هاتە سەرکار، دارایی و خواردەمەنی بەکەم زانی و ئەمە ناتەوانی ئەوی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان زیاتر کرد.

ئەم تەنگانەیە بەردەوام بوو تا ئەوەی بازرگانەکانیش چاوی تەماحیان بڕییە سامانەکەی. کوڕی رائیق چیتر لەبەسرەوە هیچی نەدەنارد و بورەیدی هەناردەکانی ئەهواز و کەنارەکانی بڕی و کوڕی بویە دەستی بەسەر فارسدا گرت و باوکی جەعفەر سەرگەردان مایەوە. قەرزەکان زیادیان کرد و پێگەی ئەو لەناوچوو و دوای سێ مانگ و نیو لەدەستپێکی وەزارەت، خۆی شاردەوە. دوای ئەو رازی، باوکی قاسم سلێمان کوڕی حەسەنی وەك وەزیر دەستنیشان کرد. ئەویش بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان و نەبوونی سامان، هاوشێوەی باوکی جەعفەر بوو.

## زاڵبوونی کوڕی رائیق لەعێراق و لەت لەت بوونی ولاّت

کاتێك رازی بینی، بارودۆخی ولاّت لەجووڵە کەوتووە، ناچار نامەیەکی بۆ ئەبوبەکر محەممەد کوڕی رائیق لەواست نووسی و بەداواکارییەکەی رازی بوو تا ئەو خەرجی و رۆژانەی سوپاکەی بەغداد دابین بکات. کاتێك نوێنەری خەلیفە ئەم هەواڵەی بەرائیق گەیاند، ئەو شادمان و بۆ ڕۆشتن بۆ بەغداد خۆی ئامادە کرد. رازی سوپای ساجییەیب بۆ لای ئەو نارد و ئەوی کردە فەرماندەی سوپاکە و بەئەمیری ئەمیرەکان ناوی برد و کۆکردنەوەی باج و سەرپەرەستی خواردەمەنی و دیوانەکانی بەو سپارد و فەرمانیدا لەسەر مینبەرەکان بەناوی ئەو وتار بخوێننەوە و خەلاّتی پێبەخشی.

سەرپەرەستی دیوانەکان و دەبیرەکان و پەردەداران هەموویان بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشتن بەلاّم سوپای حەجەرییە بۆ پەیوەست بوون بەو کەمتەرخەمییان لەخۆیان نیشان دەدا. کاتێك ئەو کەسانەی لەواسیتەوە هاتبوون، جێگوزین کران، کوڕی رائیق سوپای ساجییە لەحەوتی زیحەججە/ بیست و حەوتی ئۆکتۆبەر دەستبەسەر کرد و داروبنە و سامان و چوارپێکانی ئەوانی زەوت کرد. ئەو وای نیشاندا ئەم کارەی لەبەر ئەوان کردووە تا رۆژانەی سوپای حەجەرییە زیاتر بکات بەلاّم حەجەرییە لەم کارەی ئەو ترسان و وتیان: ئەمرۆ ئەو بەلاّی بەسەر ئەواندا هێنا، سبەی نۆرەی ئێمەیە. ئەوان لەکۆشکی خەلیفە خێوەتیان هەڵدا. کوڕی رائیق لەگەڵ بەجکەم گەیشتە بەغداد وخەلیفە لەکۆتاییەکانی زیحەججە، ناوەڕاستی ئۆکتۆبەر خەلاّتی پێبەخشی و حەجەرییە هاتنە لای و سلاّویان بۆ نارد. کوڕی رائیق فەرمانی پێدان خێوەتەکانیان هەڵگرن. ئەوانیش خێوەتەکانیان هەڵگرت و هەرکەس بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە.

لەو کاتەوە دەرگای دیوانەکان داخران و وەزارەت بڕەوی نەما و چیتر وەزیر مۆڵەتی پێدانی هیچ کارێکی نەبوو و کوڕی رائیق و دەبیرەکەی لێکۆڵینەوەیان لەکارەکان دەکرد و لەمەدوا هەرکەس فەرمانڕەوایی پێدەبڕا، بەم شێوەیە بوو. هەموو سامانەکان بۆ گەنجینەکانی ئەوان ڕەوانە دەکرا و ئەوان هەرچییان دەویست، هەڵیاندەگرت و بەو ئەندازەی خوازیاری بوون، بۆ خەلیفەیان دەنارد.

گەنجینەکانی دیکە بەستران و فەرمانڕەوایانی هەر ناوچەیەك خۆسەرانە فەرمانڕەوایەتییان دەکرد و گوێڕایەڵی فەرمانی کەس نەبوون و تەنیا بەغداد و کەنارەکانی ئەو شارە بۆ خەلیفە مایەوە کەئەویش لەژێر فەرمانی کوڕی رائیقدا بوو و خەلیفە خۆی لەکاروبارەکان هەڵنەدەقورتاند.

بەسرە، لەژێر فەرمانی کوڕی رائیقدا بوو و خوزستان، لەژێر فەرمانی بورەیدی و فارس، لەژێر دەستی عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە و کرمان، لەژێر دەستی باوکی عەلی محەممەد کوڕی ئەلیاس و رەی و ئیسفهان و چیاکان، لەژێر فەرمانی رۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە و وەشمگیر برای مەرداویج کەبۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ناوچانە لەگەڵ یەك دەجەنگان، موسڵ و دیاربەکر و موزێر و رەبیعە، لەژێر فەرمانی مناڵەکانی حەمدان و میسر و شام، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی محەممەد کوڕی توغج و مەغریب و ئەفریقییە لەژێر فەرمانی باوکی قاسم قائیم کوڕی مەهدی عەلەوی، دووەم خەلیفە لەفاتمییەکان بەنازناوی سەروەری باوەڕداران و ئاندۆلۆس، لەژێر دەستی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد بەنازناوی ناسری ئومەوی و خوراسان و ماوەرا ئەلنەهر لەژێر دەستی نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی و تەبەرستان و جورجان، لەدەستی دەیلەمییەکان و بەحرەین و یەمامە، لەژێر دەستی باوکی تاهیری قەرەمتیدا بوو.

## رۆشتنی مۆعیزئەلدەولە کوڕی بویە بۆ کرمان

لەم ساڵەدا باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی بویە بەنازناوی مۆعیز ئەلدەولە بەرەو کرمان بەرێکەوت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کاتێك عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە و براکەی رۆکن ئەلدەولە دەستیان بەسەر فارس و گیلاندا گرت و برا بچوکەکەیان باوکی حسەین ئەحمەد هیچ سەرزەمینێکی دەستنەکەوت بەشێوەیەکی جیا فەرمانڕەوایەتی بکات، دوو براکەی ئەویان بۆ کرمان ڕەوانە کرد. ئەو لەگەڵ سوپایەکی گەورە و ئامادە رێگەی گرمانی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە سیرجان، دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و باجی کۆکردەوە و بۆ خەرجی سوپاکەی تەرخانی کرد.

لەو کاتەدا ئیبراهیم کوڕی سیمجوری دەواتی لەکرمان بۆ ناکاوگیر کردنی محەممەد کوڕی ئەلیاس کوڕی ئەلیەسع هەوڵی دەدا و محەممەد لەقەڵایەك گەمارۆی خرابوویە سەر. ئیبراهیم بەهاوڕێیەتی سوپاکەی نەسر کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای خوراسان، گەمارۆدابوو. کاتێك ئیبراهیم لەهاتنی مۆعیز ئەلدەولە بۆ کرمان ئاگادار بوویەوە، لەکرمانەوە ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و بەم شێوەیە محەممەد کوڕی ئەلیاس کەمێك دەستی ئاوەڵا بوو. ئەو لەقەڵاکە هاتەدەر و بەرەو بەم بەرێکەوت کەلەدەشتی نێوان کرمان و سیستان جێگیرە. ئەحمەد کوڕی بویە شوێنی کەوت و محەممەد بێ جەنگ ڕێگەی سیستانی گرتەبەر. ئەحمەد بەرەو جیرۆفت لەئاوەدانییەکانی کرمان بەرێکەوت و یەکێك لەهاوەڵانی خۆی لەبەم بەجێهێشت.

کاتێك ئەحمەد لەجیرۆفت نزیك کەوتەوە، نوێنەری عەلی کوڕی زەنگی ناسراو بەعەلی کەلویە، پێشەوای تیرەی قوفس و بەلوچ هاتە لای. عەلی و باوەگەورێکانی لەکۆنەوە فەرمانڕەوایەتی ئەم سەرزەمینەیان دەکرد بەڵام هەر سوڵتانێك دەهاتە ئەو سەرزەمینە، دەبوونە هاوڕێی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ فەرمانەکانیان نیشان دەدا و پارەیەکی دیاریکراویان پێدەدا بەڵام ئەحمەد ڕازی نەبوو مەگەر ئەوەی بڕواتە ناو شارەکە. عەلی کەلویە دە فەرسەنگ لەلەشکرگەکەی ئەحمەد دوور کەوتەوە و لەشوێنێکی دژوار دابەزی. ئەحمەد کوڕی بویە ڕۆشتە ناو جیرۆفت و لەگەڵ عەلی سازا و ئەو بڕە پارەی عەلی دیاریکردبوو، وەریگرت و عەلیش بەناوی ئەو وتاری دەخوێندەوە.

کاتێك ئاڵای ئاشتی هەڵکرا و بارودۆخ هێور بوویەوە، یەکێك لەهاوەڵانی کوڕی بویە داوای لێکرد مەبەستی کوشتنی عەلی بکات و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشی بکاتەسەر. ئەو تەماحی سامانەکانی عەلی خستە بەردەم ئەحمەد. بەئەحمەدی وت: کوشتن و لەناو بردنی کارێکی زۆر ئاسانە چوونکە بەم پەیمانە ئارام بووە. ئەحمەد لەبەر گەنجی وبێ ئەزمونی بەوتەکانی ڕازی بوو و سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و مەبەستی ئەوەی کرد بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر عەلی.

عەلی کە لەئەحمەد خۆی بەدوور دەگرت، چەند کەسێکی وەك سیخوڕ دانابوو. کاتی جموجوڵی سوپای ئەحمەد، سیخوڕەکان عەلییان ئاگادار کردەوە. ئەویش سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و لەسەر تەنگەیەك ئەوانی جێگیر کرد. کاتێك شەوانە سوپاکەی ئەحمەد لەوێوە گوزەریان دەکرد، هاوەڵانی عەلی هێرشیان کردنەسەر و زۆربەی سوپاکەی ئەویان کوشت یا ئەسیریان کرد و تەنیا ژمارەیەکی کەم رزگاریان بوو. ئەحمەد خۆی لەچەندین شوێنەوە بریندار بوو. شمشێری قورس بەردەستی چەپی کەوت و ئەنیشکی لەناوەڕاستەوە کردە دوو کەرت. چەند پەنجەیەك لەدەستی راستی جیاببوویەوە و ناتەوان بەهۆی برینەکانییەوە لەناو کوژراوەکان کەوت. کاتێك ئەم هەواڵە بەهاوەڵانی لەجیرۆفت گەیشت، هەموویان هەڵاتن.

بۆ رۆژی دواتر لەبەرەبەیاندا، عەلی کەلویە بەناو کوژراوەکاندا دەگەڕا و ئەحمەدی بینی کەلەمەرگ نزیك بۆتەوە. ئەوی بردە جیرۆفت و پزیشکەکانی هێنا و بۆ چارەسەر کردنی هەوڵیدا. داوای لێبوردنی کرد و چەند نێردراوێکی بۆ لای براکەی عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە نارد و داوای بەخشینی لەویش کرد و لەفرت و فێڵی براکەی ئاگاداری کردەوە و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکان نیشاندا. عیماد ئەلدەولە بەفەرمانبەری ئەو رازی بوو و ئاشتی لەنێوانیان سەقامگیر کرا. عەلی هەموو ئەسیرەکانی ئازاد کرد.

بەسەرهاتی ئەحمەد کوڕی بویە بەمحەممەد کوڕی ئەلیاس گەیشت و ئەو لەسیستانەوە رێگەی شاری جەنابەی گرتەبەر. کوڕی بویە بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و رووبەرووی یەکبوونەوە. شەڕ لەنێوان ئەم دووانە چەند رۆژێك درێژەی کێشا و سەرئەنجام، ئەلیاس هەڵات و ئەحمەد کوڕی بویە سەرکەوتوو گەڕایەوە و رووی کردە عەلی کەلویە تا تۆڵەی خۆی لێ بستێنێتەوە. کاتێك کوڕی بویە لەعەلی کەلویە نزیك بوویەوە، لەگەڵ هاوەڵە پیادەکانی بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردەسەر و شەوانە کەهاورێ بوو لەگەڵ بارانێکی قورس و خوڕ، سوپاکەی عەلی کەلویەیان سەرکوت کرد و ژمارەیەکی زۆریان بریندار و دەستەیەکیان کوشت و سامانەکانیان تالان کرد و گەڕانەوە. کوڕی بویە،

پاشماوەی شەو چاوەڕوانی بوو و کاتێك بەرەبەیان هات، دووبارە هێرشی کردە سەریان و ژمارەیەکی دیکەی لیْ کوشتن و عەلی کەلویە هەڵات.

کوڕی بویە نامەیەکی بۆ عیماد ئەلدەولەی برای نووسی وئەوی لەهەواڵی جەنگی خۆی لەگەڵ ئەلیاس و شکست پێهێنانی ئەو ئاگادار کردەوە. براکەی فەرمانی پێدا لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە و لەویْ تێپەر نەبێت. عیماد ئەلدەولە یەکێك لەسەرکردەکانی بۆ لای ئەو نارد و ئەو کوڕی بویەی ناچار کرد بۆ لای براکەی لەفارس بگەڕێتەوە. کوڕی بویە بۆ لای براکەی گەڕایەوە و لەئیستەخر لای ئەو مایەوە تا ئەو کاتەی باوکی عەبدوللە بورەیدی دوای شکست خواردن لەکوڕی رائیق و بەجکەم، پەیوەستی بوو و تەماحی عیماد ئەلدەولەی بۆ گرتنی عێراق زیاتر کرد و زاڵبوون بەسەر ئەم سەرزەمینەی بەکارێکی ئاسان هاتە بەرچاو. عیماد ئەلدەولە، براکەی خۆی، مۆعیز ئەلدەولە باوکی حسەینی، کردە هاوڕێی بورەیدی و بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانەی کردن. چەند و چۆنی ئەم رووداوە لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ٩٣٨/٣٢٦ زایینی دەگێڕینەوە.

## زاڵبوونی ماکان لەجورجان

لەم ساڵەدا ماکان کوڕی کالی دەستی بەسەر جورجاندا گرت.

پاڵنەرەکەی ئەوە بوو پێشتر ئاماژەی پێدرا: کاتێك ماکان لەجورجان گەڕایەوە و لەنەیشابور نیشتەجیْ بوو، بانجین لەجورجان رۆژگاری بەسەر دەبرد. رۆژێك کەبانجین گەمەی چۆگانی دەکرد، لەئەسپ کەوتە خوار و مرد.

ماکان کوڕی کالی لەنەیشابور لەهەواڵی مەرگی ئەو ئاگادار بوویەوە. ماکان کە لەفەرماندەی سوپای خوراسان ترسا بوو، پێی وت بەدوای دەستەیەك لەسەربازە هەڵاتووەکانی خۆیدا دەگەڕێت و دەیەوێت شوێنپێی ئەوان هەڵگرێت و داوای مۆڵەتی لەفەرماندەی سوپای خوراسان کرد. عەلی کوڕی محەممەد کوڕی موزەفەر فەرماندنەی سوپاکەی خوراسان مۆڵەتی پێدا و ماکان کوڕی کالی لەنەیشابورەوە بەرەو ئەسفەراین بەرێکەوت. دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی بۆ جورجان نارد و دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. دواتر دژی محەممەد کوڕی موزەفەر ئاڵای

شۆڕشی بەرز کردەوە و لەناکاو لەئەسفەراینەوە ڕێگەی نەیشابوری گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی محەممەد کوڕی موزەفەردا بوو. هاوەڵانی موزەفەر هاوکارییان نەکرد و بەتەنیا جێیان هێشت. محەممەد کوڕی موزەفەر لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەسەربازەکانی کەبۆ جەنگ ئامادە نەبوون، بەرەو سەرەخس هەڵات و ماکان لەترسی شۆڕشی سوپاییەکان بۆ سەرەخس گەڕایەوە. ئەم پێشهاتە لەمانگی

ڕەمەزانی ساڵی ٣٢٤/ جولای٩٣٥ زایینی ڕوویدا.

## وەزارەتی فەزڵ کوڕی جەعفەر

لەم ساڵەدا کوڕی رائیق لەزمانی رازی خەلیفە نامەیەکی بۆ باوکی فەتح فەزڵ کوڕی جەعفەر کوڕی فورات نووسی و پێشنیاری وەزارەتی پێکرد. ئەو ئۆدەداری کۆکردنەوەی باجی میسر و شام بوو. کوڕی رائیق گومانی دەکرد ئەگەر ئەو وەك وەزیر هەڵبژێرێت، باجی میسر و شام بۆ خەلیفە دەبێت. فەزڵ کوڕی جەعفەر ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و پێش گەیشتنی بۆ شارەکە، خەڵاتی بۆ نێردرا. ئەو لەهیت خەڵاتی پۆشی و ڕۆشتە ناو بەغداد و هەم بەوەزارەتی خەلیفە رازی بوو هەم بەوەزارەتی کوڕی رائیق.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا خەلیفە رازی، محەممەد کوڕی توغجی وەك فەرمانڕەوای میسر دەستنیشان کرد و ئەوەی لەسەرزەمینی شام لەژێر دەستی ئەودا بوو، لەژێر فەرمانی ئەو هێشتەوە و ئەحمەد کوڕی کەیغەلغی لەفەرمانڕەوایەتی میسر لابرد.

لەشەوی هەینی ئەم ساڵە، شانزەی ڕەبیع الاوەل/ چواردەی فەوریە، مانگ بەتەواوی گیرا و بەهەمان شێوە لەشانزەی شەوال/ نۆی سێپتامبەر مانگ بەشێوەیەك گیرا کەنەدەبینرا.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە کوڕی عەبدوسی جەهشیاری قۆڵبەست کرا و دووسەد هەزار دیناریان لێ سەند.

لەم ساڵەدا عێزەد ئەللە باوکی شوجاعی فەنا خوسرەو کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە باوکی عەلی حەسەن کوڕی بویە لەئیسفەهان چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی جەعفەر کوڕی موسا کوڕی یەحیا کوڕی خالید کوڕی بەرمەك، ناسراو بەجەحزە، مرد. ئەو چەندین هۆنراوەی لێ بەجێماوە و شارەزای زانستە جۆراوجۆرەکان بوو.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی موسا کوڕی عەباس کوڕی موجاهید لەمانگی شەعبان/ جون مرد. ئەو پێشەوای قورئان خوێنەکان بوو. عەبدوللە کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی موغلیس باوکی حەسەن، فەقیهی زاهری کەچەندین نوسراوی بەناوبانگی هەیە، لەم ساڵەدا مرد.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی زیاد کوڕی واسڵ ئەبوبەکری نەیشابوری، فەقیهی شافعی لەرەبیع الاوەل/ ژانویە کۆچی دوایی کرد. ئەو لەساڵی ٨٥٢/٢٣٨ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو لەگەڵ رەبیع کوڕی سلێمان و موزنی و یونس محەممەد عەبد ئەعلا لەهاوەڵانی شافعی، هاونشین بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و پێنجی کۆچی (٩٣٧ زایینی)

### ڕۆشتنی رازی الله بۆ جەنگی بورەیدی

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی رائیق داوای لەخەلیفە رازی کرد لەگەڵ ئەو بڕواتە واست تا لەئەهواز نزیك ببێتەوە و نامە بۆ کوڕی عەبدوڵلەی بورەیدی بنووسێت، ئەگەر بەداوا و خواستەکانی رازی بوو، چ باشتر وەگەرنە بەمەبەستی جەنگ لێی نزیك ببێتەوە. رازی بەم پێشنیارەی محەممەد کوڕی رائیق رازی بوو و لەسەرەتای موحەرەم/ نۆزدەی نۆڤەمبەر بەرەو واست بەرێکەوت بەڵام حەجەرییە رازی نەبوون و وتیان: ئەمە فریوێکە دژی ئێمە تا هاوشێوەی سوپای ساجییە لەگەڵمان بجووڵێنەوە. کوڕی رائیق گرنگی بەوتەکانی ئەوان نەدا و ڕێگەی واستی گرتەبەر. دەستەیەك لەسوپای حەجەرییە شوێنی کەوتن و کەسانی دیکە بەدوای ئەواندا ڕێگەی واستیان گرتەبەر. کاتێك گەیشتنە واست، کوڕی رائیق تانەی لێدان و زۆربەی ئەوانی تاراند. بەم شێوەیە سوپای حەجەرییە شڵەژا و شۆڕشیان کرد و کوڕی رائیق ڕووبەڕوویان بوویەوە. سوپای حەجەرییە هەڵاتن و دەستەیەك لەوان کوژران.

کاتێك هەڵاتووان گەیشتنە بەغداد، لۆلۆ، فەرماندەی پاسەوانەکانی بەغداد، سوار لەسەر ئەسپ هێرشی کردنەسەر و ڕووبەڕوویان بوویەوە و بەم شێوەیە سوپای حەجەرییە خۆیان داشارد. ماڵی سەربازەکانی سوپای حەجەرییە تاڵان کرا و دەست بەسەر سامان و زەوییەکانیاندا گیرا و ڕۆژانەکەیان بڕا.

کاتێك کوڕی رائیق لەدەست سوپای حەجەرییە ئاسوودە بوو، سەربازە زیندانییەکانی سوپای ساجییەی کوشت و تەنیا ساف خان و هارون کوڕی موسای زیندوو هێشتەوە. داوتر خێوەتی خۆی و رازی بەرەو ئەهواز برد تا کوڕی بورەیدی لەوێ دوور بکاتەوە. ئەو نوێنەرێکی بۆ لای کوڕی بورەیدی نارد و پرسی بۆ لەڕەوانە کردنی پارە خۆی دوادەخات و خۆپەسەندی کردۆتە پیشە و سوپاییەکانی لەناو بردووە و بۆ یاخی بوون هانی داون. باسی ناسازگارییەکانی کرد. ئەو لەپەیامەکەی خۆیدا وتی ئەگەر باج ڕەوانە بکات و سەربازە یاخیی

بووەکان بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات، ئەو وەك فەرمانڕەوای ئەو شارە دەهێڵێتەوە و ئەگەر خۆی بەدوور بگرێت ئەو بەڵای بەسەردا دێنێت کەشیاوە بۆی.

کاتێك کوڕی بورەیدی پەیامەکەی ئەوی بیست، دووبارە بەڵێنیدا ساڵانە سێسەد و شەست هەزار دینار باج ڕەوانە بکات و ئەم بڕە مانگ مانگ بنێرێت. ئەو ڕازی بوو سوپاکەی خۆی بەهەر کەسێك دیاری دەکرێت، بسپێرێت تا ئەوان بۆ جەنگی کوڕی بویە ڕەوانە بکات چوونکە ئەم سوپایە لەبەر دەستکورتی بەغداد و ناسازگاری سەرکردەکانی ئەم شارە، لەڕۆشتن بۆ جەنگ خۆیان بەدوور دەگرن. نێردراوەکان ئەم پەیامەیان بۆ کوڕی رائیق نووسی و ئەو، نامەکەی نیشانی خەلیفەدا و خەلیفە، لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی ڕاوێژی کرد. حسەینی نەوبەختی وتی: هەنووکە کەلێی نزیکن، بەوتە و خواستەکانی ڕازی مەبن، چوونکە ئەوکەسێکی فێڵبازە و ئەگەر هەنووکە دەستی لێ هەڵگرن، بەڵێنەکانی خۆی ناباتەسەر.

ئەبوبەکر کوڕی موقاتیل وتی دەبێت بەبەڵێن و خواستەکانی ڕازی ببین. وتی: هیچ کەس ناتوانێت لەجێگەی ئەو دانیشێت. ئەو لایەنگری بورەیدی بوو. کوڕی رائیق بەوتەکانی ئەبوبەکر ڕازی بوو و بۆ بورەیدی پەیمان نامەیەکی ئامادە کرد و لەگەڵ ڕازی بۆ بەغداد گەڕایەوە. خەلیفە لەهەشتی سەفەر/ بیست و حەوتی دێسامبەر هاتە ناو بەغداد.

لەبورەیدییەوە یەك دینار نەگەیشتە بەغداد. کوڕی رائیق، جەعفەر کوڕی وەرقای نارد تا سوپاکە لەبورەیدی وەربگرێت و بەرەو فارس ڕەوانەی بکات. کاتێك جەعفەر گەیشتە ئەهواز، بورەیدی لەگەڵ سوپاکەی پێشوازی کرد و دوای گەڕانەوە لەپێشوازی، هەموو سوپاییەکان ڕۆشتنە ماڵی بورەیدی. جەعفەریش لەوێ بوو. بورەیدی خواردنێکی زۆری ئامادە کردبوو. سەربازەکان خواردیان و گەڕانەوە. جەعفەر چەند ڕۆژێك مایەوە.

جەعفەر فەرمانی بەسوپاکەدا لەگەڵ ئەو بەرێکەون. سوپا داوای پارەیان کرد تا خۆیان بۆ ڕۆشتن بۆ فارس ئامادە بکەن بەڵام جەعفەر پارەی پێ نەبوو. بەم شێوەیە سەربازەکان جوێنباران و هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد. جەعفەری خۆی

شاردەوە و پەنای بۆ بورەیدی برد. بورەیدی پێی وت: لەوەی تۆی ڕەوانە کردووە، سەرم سوڕنەماوە، سەرم لەتۆ سوڕماوە چۆن بێ پارە هاتیت بۆ ئێرە. ئەگەر ئەم سوپایە هەمووی بەندی بەزێر کراو دەبوون، لەگەڵ ئەوەیشدا بێ وەرگرتنی پارە و ڕازی بوونیان، لەگەڵ تۆدا نەدەهاتن. دواتر لەکاتی شەودا ڕێگی هەڵاتنی بۆ کردەوە و وتی: گیانی خۆت ڕزگار بکە. ئەو بەدەستی بەتاڵ بۆ بەغداد گەڕایەوە.

کوڕی موقاتیل گفتوگۆی لەگەڵ کوڕی رائیق کرد تا حسەین کوڕی عەلی نەوبەختی لەوەزارەت دوور بخاتەوە و داوای لێکرد پشت بەهاوکاری بورەیدی ببەستێت و لەجێگەی نەوبەختی ئەو وەك وەزیر دەستنیشان بکات و سی هەزار دیناری بەکوڕی رائیقدا بەڵام کوڕی رائیق ڕازی نەبوو. کوڕی موقاتیل بەرادەیەك سەرسەختی کرد تا سەرئەنجام کوڕی رائیق بەوەزارەتی بورەیدی ڕازی بوو. ئەوەی پێش هەر شتێك کوڕی موقاتیلی لەخواستەکەی نزیك کردەوە ئەوە بوو نەوبەختی لەسەر جێگە کەوتبوو. کاتێك کوڕی موقاتیل لەگەڵ کوڕی رائیق سەبارەت بەلابردنی نەوبەختی دەدوا، کوڕی رائیق بەلابردنی ئەو ڕازی نەبوو و وتی: ئەو ماڤ زۆری لەملی مندایە و بەهۆی هەوڵەکانی ئەو بوو ئەم پێگە و جێگەم بەدەست هێنا و من بەدوای جێگرێك بۆ ئەو ناگەرێم. کوڕی موقاتیل وتی: نەوبەختی نەخۆشە و کەس بەتەمای چاکبوونەوەی ئەو نییە. کوڕی رائیق وتی: پزیشکەکەی پێی وتووم ئەو تەندروستی خۆی بەدەست هێناوەتەوە و کەوێکی خواردووە. کوڕی موقاتیل وتی: پزیشك لەپێگەی ئەو لای تۆ ئاگادارە و دەزانێت وەزیرەی ئەم دەوڵەتەیە و بەخراپە باسی ئەو ناکات چوونکە تۆ پەسەندی ناکەیت. دەتوانیت برازا و زاوای نەوبەختی، عەلی کوڕی ئەحمەد، بانگ بکەیت و بەشێوەیەکی نهێنی لێی بپرسیت. ئەو لەبارودۆخی وەزیر ئاگادارت دەکاتەوە. کوڕی رائیق وتی: ئەو کارە دەکەم.

نەوبەختی برازاکەی خۆی وەك نوێنەر بۆ لای کوڕی رائیق ناردبوو تا لەکاتی نەخۆشی ئەو، خزمەتی کوڕی رائیق بکات. لەم کاتەدا کوڕی موقاتیل لای کوڕی رائیق ڕۆشت و چاوی بەعەلی کوڕی ئەحمەد کەوت و پێی وت: من پێشنیاری وەزارەتی تۆم بەکوڕی رائیق کردووە، کەواتە ئەگەر سەبارەت بەتەندروستی مامت

پرسیاری لێکردیت، پێی بڵێ لەسەرە مەرگدایە و چیتر ناتوانێت کاروباری وەزارەت ڕاپەڕێنێت.

کاتێك کوڕی ڕائیق، عەلی کوڕی ئەحمەدی بانگ کرد و لەتەندروستی مامی پرسی، عەلی بەشەقەزللە کەوتە سەروچاوی خۆی و وتی: خواوەند تەمەنی درێژ بەئەمیر ببەخشێت و پاداشتی نەوبەختی بداتەوە. ئەمیر چیتر دەبێت وەك مردوو حسێبی بۆ بکات. کوڕی ڕائیق انا لله و انا الیه راجعون و لا حول و لا قوه الا بالله ی هێنایە سەرزمان و وتی: ئەگەر هەموو سامانەکام بۆ بەهای چاکبوونەوەی ئەو داوا بکەن، دەیدەم.

کاتێك کوڕی موقاتیل لای کوڕی ڕائیق ڕۆشت، کوڕی ڕائیق پێی وت: تۆ ڕاستت وت و ئێمە لەنەوبەختی بێ هیوا بووین، نامەیەك بۆ بورەیدی بنووسە تا نوێنەرێك بۆ وەزارەتی خۆی ڕەوانە بکات. کوڕی موقاتیل نامەی بۆ بورەیدی نووسی و داوای لێکرد ئەحمەد کوڕی عەلی کوفی وەك نوێنەری خۆی بۆ وەزارەتی کوڕی ڕائیق ڕەوانە بکات. ئەویش ئەحمەدی نارد. ئەحمەد جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست و پێگەی بورەیدی بەرز دەبوویەوە بەڵام بەبوونی نەوبەختی – کە لەکارەکانی ئەو ئاگادار بوو– بەو شێوەی دەیویست، کاروبارەکان ڕێك نەدەخران.

کاتێك کوفی و کوڕی موقاتیل کاروبارەکانیان گرتەدەست، هەوڵیاندا کۆکردنەوەی باجی بەسرە بەباوکی یوسف کوڕی بورەیدی، برای باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی بسپێرین. کوڕی ڕائیق ڕازی نەبـ ئەم دوانە فریویاندا و سەرئەنجام ڕازی بوو. نوێنەری کوڕی ڕائیق لەبەسرە محەممەد کوڕی یەزداد بوو کە بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ خەڵکی ئەو شارە دەکرد و ستەمکاری کردبووە پیشە. کاتێك بورەیدی بەڵێنی ڕەوانە کردنی باجیدا، دەستەیەك لەگەورەکانی بەسرە ڕۆشتنە ئەهواز بۆ لای بورەیدی. بورەیدی بەڵێنی پێدان و بەئامادە بوونی ئەوان سەرکۆنەی کوڕی ڕائیقی کرد بۆ ئەوەی بەکردەوە و ستەمەکانی یەزید ڕازی دەبێت. ئەوان بۆ بورەیدی پاڕانەوە.

لەم کاتەدا بورەیدی، کۆیلەکەی خۆی، ئیقباڵی لەگەڵ دوو هەزار پیاوی جەنگاوەر ڕەوانە کرد وفەرمانی پێدا تا فەرمانی دواتر لەقەلای مەهدی بمێنێتەوە.

کاتێك کوڕی یەزداد لەهاتنی ئەم سوپایە ئاگادار بوویەوە، شڵەژا و دڵنیابوو لەوەی بورەیدی دەخوازێت دەست بەسەر بەسرەدا بگرێت چوونکە ئەگەر تەنیا خوازیاری کۆکردنەوەی باج دەبوو، تەنیا نوێنەرەکەی و ژمارەیەکی کەم بۆ ئەو مەبەستە بەسەندەی دەکرد.

بورەیدی فەرمانیدا لەو باجەی کوڕی یەزداد لەخەڵکانی بەسرەی وەردەگرێت، کەم بکەنەوە تا بەم شێوەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندی خەڵکی ئەو شارە بەدەست بێنێت بۆ ئەوەی شان بەشانی سوپاکەی دژی سوپاکەی کوڕی رائیق بجەنگن. دواتر بورەیدی زیاتر ڕێزی گرتن بەڵام کاتێك سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەشێوەیەك مامڵەی لەگەڵ کردن کەخەڵکان خوازیاری گەڕانەوە بۆ ڕۆژگاری کوڕی رائیق بوون و ئەو ڕۆژانەیان جەژن دەگرت.

## تێکچوونی پەیوەندییەکانی کوڕی رائیق و بورەیدی و جەنگی ئەوان

لەم ساڵەدا پەیوەندییەکانی نێوان کوڕی رائیق و بورەیدی تێکچوو. ئەم تێکچوونە چەند هۆکارێکی لەپشتەوە بوو کەیەکیان بریتییە لە: کاتێك کوڕی رائیق لەواستەوە بۆ بەغداد گەڕایەوە، فەرمانیدا سەربازەکانی سوپای حەجەرییە کەخۆیان شاردبوویەوە، خۆیان ئاشکرا بکەن. کوڕی رائیق نزیکەی دوو هەزار کەس لەوانی بەخزمەت گرت و فەرمانی بەوانی دیکەدا بۆ بەدەست هێنانی بژێوی خۆیان، بۆ کوێ دەخوازن بڕۆن. ئەوان بەغدادیان بەجێهێشت و لەرێگەی خوراسان کۆبوونەوە و دواتر بۆ پەیوەست بوون بەباوکی عەبدوڵلەی بورەیدی ملی ڕێگەیان گرتەبەر. بورەیدی ڕێزی گرتن و چاکەی لەگەڵ کردن و سەرکۆنەی کوڕی رائیقی کرد. لەلایەکی دیکە نامەی بۆ بەغداد نووسی و لەوەرگرتنی ئەوان داوای لێبوردنی کرد و وتی: من لەترسا ڕێزیان دەگرم. ئەوانی کردە بیانوو بۆ ئەوەی باج ڕەوانە نەکات. کوڕی رائیق چەند نوێنەرێکی بۆ لای بورەیدی نارد تا سوپای حەجەرییە لەخۆی دوور بکاتەوە بەڵام بورەیدی ئەو کارەی نەکرد.

یەکێکی دیکە لەهۆکارەکانی تێکچوونی پەیوەندی ئەوان ئەوە بوو کوڕی رائیق ئاگادار بوویەوە بوردیدی لای خەڵکانی بەسرە سەرکۆنەی کردووە و ئەمەی پێ

ناخۆش بوو. هەروەها هەواڵی پێگەیشت کەئیقباڵ لەگەڵ سوپایەك لەقەڵای مەهدی جێگیرە و نەیدەتوانی بەمە رازی ببێت و گومانی لەکوفە کرد کەلایەنگری بورەیدییە و بڕیاریدا ئەو لەسەر کار لاببات بەڵام ئەبوبەکر محەممەد کوڕی موقاتیل کەکوڕی رائیق بەوتەکانی رازی دەبوو، رێگەی ئەم کارەی لێگرت و فەرمانی بەکوفیدا نامەیەك بۆ بورەیدی بنووسێت تا سوپاکەی لەقەڵای مەهدی بگەڕێنێتەوە. بورەیدی لەوەڵامدا وتی خەڵکانی بەسرە لەقەرەمتییەکان دەترسن و کوڕی یەزداد لەپشتیوانی کردنی ئەوان ناتەوانە وئەوان لەترسا پەنایان بۆ من هێناوە.

لەو کاتەدا باوکی تاهیری قەرەمتی لەبیست و سێی رەبیع الاوەل/ دەی مارس گەیشتە کوفە و کوڕی رائیق و سوپاکەی ڕۆشتنە کۆشکی کوڕی هوبەیرە. کوڕی رائیق نوێنەرێکی بۆ لای کوڕی قەرەمتی نارد بەڵام ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر نەبوو و قەرەمتی بۆ شارەکەی خۆی گەڕایەوە و کوڕی رائیق رێگەی واستی گرتەبەر. ئەم هەواڵە بەبورەیدی گەیشت و فەرمان نامەیەکی بۆ سوپاکەی لەقەڵای مەهدی نووسی تا بڕۆنە ناو بەسرە و هەرکەس رووبەروویان بوویەوە، لەناوی ببەن. ئەو دەستەیەك لەسەربازەکانی حەجەرییەی بۆ هاوکاری ئەوان نارد. کوڕی یەزداد دەستەیەکی ڕەوانە کرد تا رێگەی لەڕۆشتنی ئەم سوپایە بۆ ناو شارەکە بگرن. لەکەنار ڕووباری ئەمیر جەنگ روویدا و سوپاکەی کوڕی یەزداد شکستی خوارد. کوڕی یەزداد هێزە تێکشکاوەکانی بەڕەشبگیری دووبارە رێکخستەوە و ئەوانی بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕاندەوە بەڵام ئەم جارەیش تێکشکان.

ئیقباڵ و سوپاکەی بورەیدی ڕۆشتنە ناو بەسرە و کوڕی یەزداد بۆ کوفە هەڵات. کوڕی رائیق نەیدەتوانی بەمە رازی ببێت و نامەیەکی بۆ عەبدوڵڵەی بورەیدی نووسی و ئەوی ترساند و داوای لێکرد سوپاکەی لەبەسرە بباتەدەر. بورەیدی داوای لێبوردنی کرد و فەرمانەکەی ئەنجام نەدا. خەڵکی بەسرە سەرەتا لەبەر خراپەکارییەکانی کوڕی یەزداد بەهاتنی بورەیدی بۆ ناو شارەکە رازی بوون.

## زاڵبوونی بەجکەم لەئەهواز

کاتێك هەواڵی نەگەڕاندنەوەی سوپاکەی بورەیدی بەکوڕی رائیق گەیشت، بەدری خەرشەنی بانگ کرد و خەڵاتی پێبەخشی. هەروەها بەجکەمی بانگ کرد و خەڵاتی بەویشدا و هەدووکیانی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی بورەیدی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان لەجامیدە بمێننەوە. بەجکەم پەلەی کرد و بێ ئەوەی چاوەڕوانی هاتنی بەدر و سوپاکەی ئەو بێت، ڕێگەی شوشی گرتەبەر.

بورەیدی لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و سوپایەکی سێ هەزار کەسی بۆ جەنگی بەجکەم ڕەوانە کرد. فەرماندەی ئەم سوپایە کۆیلەکەی ئەو ناسراو بەناوی محەممەدی حەماڵ بوو. دوو سوپا لەدەرەوەی شووش ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. تەنیا دووسەد و حەفتا پیاوی تورك هاوڕێیەتی بەجکەمیان دەکرد. هاوەڵانی بورەیدی بۆ لای ئەو هەڵاتن و سوپاکەی بورەیدی تێکشکا. بورەیدی لەمحەممەدی حەماڵیدا و وتی: بەسوپایەکی سێ هەزار کەسییەوە شکستت خوارد؟ محەممەد پێی وت: تۆ گومانت کردووە لەگەڵ یاقوتی بەخت هەڵگەڕاوە دەجەنگیت. ئەوانەی دژی تۆ دەجەنگن جیاوازن لەوەی بیریان لێ دەکەیتەوە. بورەیدی پەلاماری محەممەدیدا و دەمەوچاوی بەرمستەکۆڵەدا.

بورەیدی سوپاکەی خۆی لەگەڵ دەستەیەکی بێ ئەزمون بۆجەنگ گەڕاندەوە و ژمارەیان بوو بەشەش هەزار کەس. بورەیدی ئەم سوپایەی لەگەڵ حەماڵ بۆ جەنگی بەجکەم ڕەوانە کرد. هەردوو سوپا لەکەنارەکانی شوشتەر ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. بەجکەم پێشدەستی کرد و لەگەڵ سوپاکەی لەرووبار پەڕییەوە. کاتێك سوپاکەی بورەیدی ئەویان بینی، بێ جەنگ، هەڵاتن. کاتێك باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی ئەمەی بینی، لەگەڵ برا و هاوەڵانی خۆی سوار کەشتی بوو. سامانەکەی خۆی کەنزیکەی سێسەد هەزار دینار بوو، هەڵگرت بەڵام کەشتییەکەی تێکشکاو و مەلەوانەکان ئەوانیان رزگار کرد کە لەنوقوم بووندا بوون و بەشێك لەسامانەکەی ئەویان لەئاو هێنایەدەر. پاشماوەی سامانەکە کەوتە دەستی بەجکەم. بورەیدی لەگەڵ سوپاکەی گەیشتە بەسرە و لەئوبولە مایەوە و

کەشتییەکانیان بۆ هەڵاتن ئامادە کرد تا لەئەگەری سەرنەکەوتنی ئیقباڵ هەڵبێن.

بورەیدی، ئیقباڵی کۆیلەی خۆی بۆ مەتارا نارد و دەستەیەك لەگەنجەکانی بەسرەی کردە هاوڕێی. ئەوان لەمەتارا ڕووبەڕووی سەربازەکانی کوڕی رائیق بوونەوە و شکستیان پێهێنان و دەستەیەك لەوان ئەسیر کران بەڵام بورەیدی ئەوانی ئازاد کرد و نامەیەکی هاوڕێیانەی بۆ کوڕی رائیق نووسی و دەستەیەك لەگەورەکانی بەسرەی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد بەڵام کوڕی رائیق وەڵامی نەدانەوە. ئەوان داوایان لەکوڕی رائیق کرد سوێند بخوات ئەگەر دەستی بەسەر بەسرەدا گرت، زیان لەوان نەدات و ڕێگە بدات خەڵکانی بەسرە هاوکاری بکەن. کوڕی رائیق رازی نەبوو و سوێندی خوارد ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنێت، بەسرە دەسووتێنێت و هەموو دانیشتوانەکەی کوشتار دەکات. ئەمە بووە هۆی ئەوەی خەڵکانی بەسرە دژی ئەو بجەنگن.

سوپاکەی بورەیدی دوای شکستی سوپاکەی کوڕی رائیق ئاسوودە بوون و لەبەسرە ئوردوویان لێدا و بەجکەم دەستی بەسەر ئەهوازدا گرت. کاتێك کوڕی رائیق هەواڵی شکستی سوپاکەی خۆی بیست، سوپایەکی دیکەی کۆکردەوە و لەرێگەی وشکانی و ئاو، ئەوانی ڕەوانە کرد. ئەو سوپای ڕێگەی وشکانی گرتبووەبەر، ڕووبەڕووی سوپاکەی بورەیدی بوویەوە و دەرئەنجامی جەنگەکە، سوپاکەی کوڕی رائیق هەڵاتن بەڵام هێزە دەریاییەکانی ئەو دەستیان بەسەر کەلا گرت و کاتێك باوکی عەبدوللەی بورەیدی ئەم دۆخەی بینی، سوار کەشتی بوو و بۆ دوورگەی ئەوال هەڵات و باوکی حسەینی برای، لەبەسرە بەجێهێشت تا سوپاکەی لەم شارە بپارێزێت. دانیشتوانی بەسرە لەگەڵ باوکی حسەین هاتنەدەر بۆ ئەوەی سوپای کوڕی رائیق لەکەلا دووربخەنەوە. جەنگیان دەستپێکرد و سەرئەنجام توانیان ئەوان لەکەلا دەرپەڕێنن.

کاتێك ئەم هەواڵە بەکوڕی رائیق گەیشت، خۆی ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر. نامەیەکی بۆ بەجکەم نووسی تا پەیوەستی ببێت. بەجکەم و سوپاکەی پەیوەستی بوون و جەنگیان دژی خەڵکانی بەسرە هەڵگیرساند. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و خەڵکانی بەسرە بەرگرییان دەکرد و جوێنیان بەکوڕی رائیق دەدا. کاتێك

بەجکەم ئەم دۆخەی بینی، سەری سوڕما و لەکوڕی رائیقی پرسی: چ بەڵایەکت بەسەر ئەم خەڵکە هێناوە کەبەم شێوەیە دوژمنایەتی تۆ دەکەن؟ کوڕی رائیق وتی: سوێند بەخوا نازانم. کوڕی رائیق و بەجکەم بۆ لەشکرگەکەی خۆیان گەڕانەوە.

باوکی عەبدوللەی بورەیدی، لەدوورگەی ئەوالەوە بەرەو لای عیماد ئەلدەولە کوڕی بوویە رۆشت و داوای پەنای لێکرد و بۆ گرتنی عێراق تەماحی خستە بەردەم و لەناوبردنی خەلیفە و کوڕی رائیقی بەکارێکی سووك نیشاندا. عیماد ئەلدەولە -وەك ئاماژەی پێدەدرێت- براکەی مۆعێز ئەلدەولەی لەگەڵ ئەو ڕەوانە کرد.

کاتێك کوڕی رائیق بیستی ئەوان لەفارسەوە بەرەو ئەهواز بەرێکەوتوون، بەجکەمی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. بەجکەم بەو مەرجە رازی بوو لەگەڵ ئەوان بجەنگێت کەفەرماندەیی جەنگ و کاروباری کۆکردنەوەی باج بەو بسپێردرێت. کوڕی رائیق رازی بوو و ئەوی بۆ جەنگی عەبدوللەی بورەیدی و عیماد ئەلدەولە ڕەوانە کرد.

دەستەیەك لەهاودلآنی بورەیدی شەوانە مەبەستی سوپاکەی کوڕی رائیقیان کرد و لەهەموو شوێنەکانی ئوردووکەی کوڕی رائیق دەنگەدەنگیان نایەوە و بەهەلآتن ناچاریان کردن. کاتێك کوڕی رائیق ئەمەی بینی، فەرمانیدا خێوەت و کەرەستەکانی جەنگ بسووتێنن تا دەست بورەیدی نەکەوێت. ئەو خۆی بەرەو ئەهواز ئەسپی غاردا. دەستەیەك داوایان لەبەجکەم کرد بیگرێت بەڵام بەجکەم ئەو کارەی نەکرد. کوڕی رائیق چەند رۆژێك لەئەهواز مایەوە و دواتر رێگەی واستی گرتەبەر. سوپاکەی پێش ئەو گەیشتبوونە ئەو شارە.

## شۆڕش لەنێوان خەڵکانی سەقەلییە و فەرماندەکانیان

لەم ساڵەدا خەڵکانی جورجەنت، یەکێك لەشارەکانی سەقەلییە (سیسیل) دژی فەرمانڕەواکەی خۆیان، سالیم کوڕی راشید، شۆڕشیان کرد. قائیمی عەلەوی، سالمی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە دەستنیشان کردبوو. ئەو بەشێوەیەکی خراپ هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکان دەکرد. خەڵکانی شار، کارگوزارەکەی سالمیان دەرپەڕاند و سالم سوپایەکی گەورەی لەدانیشتوانی سەقەلییە و ئەفریقییە بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. خەڵکانی جورجەنت بوێرانە جەنگان و شکستیان بەو سوپایە هێنا و شوێنیان کەوتن. سالیم بۆ جەنگی ئەوان هاتەدەر و ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئاگری شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان هەڵگیرسا و خەڵکانی جورجەنت لەشەعبان/ جون، شکستیان خوارد.

خەڵکانی پایتەختیش کاتێك شۆڕشی خەڵکانی جورجەنتیان بینی، دژی سالم ڕاپەڕین و ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر. شۆڕشی ئەوان بۆ سالم دژوار و لەزیقەعدە/ سێپتامبەر ڕووبەڕووی ئەم دەستەیە بوویەوە و شکستی پێهێنان و گەمارۆی خستنەسەر. ئەو بۆ قائیم لەمەهدییە نامەیەکی نارد کەخەڵکانی سەقەلییە سەرپێچی فەرمانەکان دەکەن و ناسازگارییان کردۆتە پیشە. داوای هاوکاری لەقائیم کرد. قائیم سوپایەکی بۆ هاوکاری ئەو نارد و خەلیل کوڕی ئیسحاقی وەك فەرماندەی ئەم سوپایە دەستنیشان کرد. ئەم سوپایە ڕێگەی سەقەلییەی گرتەبەر. خەلیل بەرادەیەك خەڵکانی سەقەلییە بەملکەچی فەرمانەکان بینی، کەرازی بوو. خەڵکی ئەم شارە لەستەم و خراپەکارییەکانی سالیم لای خەلیل سکاڵایان بەرز کردەوە و ژن و مناڵ دەرۆشتنە لای و فرمێسکیان لەچاو دەباراند و گلەییان دەکرد. سوپا بەزەیی بەخەڵکدا هاتەوە و بەهۆی گریانی ئەوان، دەگریان.

خەڵکانی پایتەخت و جورجەنت بۆ لای خەلیل بەرێکەوتن بەڵام سالیم ئەوانی ئاگادار کردەوە کەقائیم ئەم سوپایەی ڕەوانە کردووە تا لەتۆڵەی کوشتنی سەربازەکانی، خوێنیان بڕێژێت وکوشتاریان بکات. ئەوان دووبارە ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر. خەلیل لەکەنار لەنگەرگەی شارەکە، دروست کردنی

شارێکی دەستپێکرد و سەنگەری بۆ هەڵکەند و زۆربەی شارەکەی وێران و دەروازەکانی خاپور کرد. شارەکەی خۆی ناونا خاڵسە.

خەڵکان بەهۆی دروست کردنی ئەم شارە، کەوتنە ڕەنجی زۆرەوە تا ئەوەی خەڵکانی جورجەنت لەم کارە ئاگادار بوونەوە. ترسان و گومانیان لەراستی وتەکانی سالیم کرد. لەبەر ئەمە لەشارەکەی خۆیان سەنگەریان گرت و خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد. خەلیل لەجومادی ئلاوەلی ٣٢٦/ مارسی ٩٣٨ زایینی هێرشی کردە سەریان و گەمارۆی خستنەسەر. ئەوان لەشارەکەیان هاتنەدەر و جەنگێکی قورس دەستپێکرد. خەلیل بۆ ماوەی هەشت مانگ گەمارۆی خستبوونە سەر. هەموو رۆژێك جەنگ بەردەوام بوو تا ئەوەی زستان لەرێگەوە هات و خەلیل لەزیحەجچە/ سێپتامبەر بۆ خاڵسە گەڕایەوە و لەوێ ئوردووی لێدا.

لەساڵی ٩٣٩/٣٢٧ زایینی، خەڵکانی قەلاً نشین و دانیشتوانی مازەر رێگەی ناسازگارییان گرتەبەر. ئەم ناسازگارییە بەهۆی هەوڵی خەڵکانی جورجەنتەوە سەرچاوەی گرت. نەیارەکان، دەستە دەستە جەنگاوەرانیان ڕەوانە دەکرد تا ئەوەی پێگەیان بەرز بوویەوە و نامەیان بۆ فەرمانڕەوای کۆنستانتین ئۆپێل نارد و داوای هاوکارییان لێکرد. ئەویش بەکەشتی لێوانلێو لەجەنگاوەر و خواردەمەنی هاوکاری کردن. خەلیل نامەیەکی بۆ قائیم نووسی و داوای هاوکاری کرد. ئەویش چەندین کەشتی جەنگی و خواردەمەنی نارد. سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری خەلیل ڕەوانە کرد. خەلیل لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرێکەوت و قەلاّی باوکی سوری گەمارۆدا و دەستی بەسەردا گرت. هەروەها بلۆتیان خستە ژێر فەرمانی خۆیانەوە و گەمارۆیان خستە سەر قەلاّی ئەبلانتوا (بلانتوا) و تا کۆتایی ساڵی ٩٣٨/٣٢٧ زایینی لەوێ مانەوە.

لەساڵی ٩٣٩/٣٢٨ زایینی، خەلیل ئەبلانتوانی بەجێهێشت و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ گەمارۆی خستە سەر جورجەنت و سوپایەکی بۆ ئەو مەبەستە راسپارد. باوکی خەلەف کوڕی هارون، فەرماندەی ئەم سوپایە بوو. ئەم گەمارۆیە تا ساڵی ٩٤٠/٣٢٩ زایینی درێژەی کێشا و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ئەو شارە رێگەی رۆمیان گرتەبەر و پاشماوەکان داوای ئەمانیان کرد. باوکی خەلەف

بەو مەرجە ئەمانی پێ بەخشین کە لەقەڵاکە بێنەدەر. کاتێك لەقەڵاکە هاتنەدەر، باوکی خەلەف فێڵی لێکردن و هەموویانی ئەسیر کرد.

کاتێك دانیشتوانی قەڵاکانی دیکە ئەم بارودۆخەیان بینی، ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکان نیشاندا. کاتێك دووبارە سەرزەمینە ئیسلامییەکان دەستەمۆی قائیم بوونەوە، لەزیحەججەی ٣٢٩/ئوتی ٩٤٠ زایینی خەلیل بۆ ئەفریقییە گەڕایەوە و گەورەکانی جورجەنتی لەگەڵی خۆی برد و سوار کەشتی کردن. دواتر فەرمانی نغرۆ کردنی کەشتییەکەی لەناو دەریا دەرکرد و هەموویان خنکان.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا فەرەنگەکان هێرشیان کردە سەر سەرزەمینەکانی ئاندۆلۆس کە لەدەستی موسوڵماناندا بوو. کوشتیان و فڕاندیان و گرتیان و ژنەکانیان ئەسیر کرد. یەکێك لەکوژراوە ناودارەکان جوحاف کوڕی یومن، قازی بالنسیا بوو.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی سوفیان باوکی حەسەنی خەرازی نەحوی لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ فەوریە مرد. ئەو یەکێك لەهاوەڵانی سەعلەب و موبەرید و لەزانستە قورئانییەکان چەندین نووسراوی لێ بەجێ ماوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و شەشی کۆچی ( ٩٣٨ زایینی )

## زاڵبوونی مۆعیز ئەلدەولە لەئەهواز

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی بویە بەرەو ئەهواز و سەرزەمینەکانی ڕەوانە کرا و دەستی بەسەر ئەو سنورانەدا گرت و هەمووی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

هۆکارەکەی وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ڕۆشتنی باوکی عەبدوللەی بورەیدی بۆ لای عیماد ئەلدەولە بوو. کاتێك بورەیدی گەیشتە لای عیماد ئەلدەولە، تەماحی گرتنی عێراق و زاڵبوون بەسەر ئەو سەرزەمینەی خستە بەردەست و عیماد ئەلدەولە، مۆعیز ئەلدەولەی برای بۆ ئەهواز ڕەوانە کرد. باوکی عەبدوللەی بورەیدی دوو کوڕەکەی خۆی: باوکی حەسەن محەممەد و باوکی جەعفەری فەیازی وەك بارمتە لای عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە بەجێهێشت و ڕێگەی ئەهوازیان گرتەبەر. بەجکەم ئاگادار بوویەوە کەئەم سوپایە لەدۆڵی ئەرجان دابەزیوە. بەجکەم بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوت بەڵام شکستی خوارد.

شکستی بەجکەم لەبەر ئەوە بوو باران بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بێ وەستان باری و بەمشێوەیە زێی کەوانی تورکەکان (کەباشترین کەرەستەی جەنگی ئەوان بوو) بەهۆی تەڕ بوونەوە لەکار کەوت و چیتر نەیانتوانی تیر بهاوێژن. بەجکەم گەڕایەوە و لەئەهواز نیشتەجێ بوو و دەستەیەك لەسوپاکەی لەبەرابەر عەسکەر موکەرەم جێگیر کرد. ئەوان بۆ ماوەی سیانزە ڕۆژ ڕووبەڕووی مۆعیز ئەلدەولە بوونەوە و دواتر بۆ شوشتەر هەڵاتن. مۆعیز ئەلدەولە دەستی بەسەر عەسکەر موکەرەمدا گرت و بەجکەم لەئەهوازەوە ڕێگەی شوشتەری گرتەبەرو دەستەیەك لەگەورەکانی ئەهوازی لەگەڵ خۆی برد و لەوێوە بەرەو واست ڕۆشت و لەرێگەدا نوێنەرێکی بۆ لای کوڕی رائیق نارد و لەرووداوەکە ئاگاداری کردەوە و وتی: سوپا پێویستی بەپارەیە، ئەگەر دووسەد هەزار دینارت هەیە، لەواست بمێنەرەوە تا پەیوەستی تۆ بین و پارە لەناو سوپاکە دابەش بکەین و ئەگەر پارەی کەمت پێیە باشتر وایە بۆ

بەغداد بگەڕێیتەوە تا ئاژاوە لەناو سوپاییەکان دروست نەبێت.

کاتێك ئەم پەیامە بەدەست کوڕی رائیق گەیشت، لەواستەوە بەرەو بەغداد گەڕایەوە و بەجکەم گەیشتە واست و لەوێ مایەوە. لەوێ ئەهوازییەکانی ( کەلەگەڵ خۆیدا بوون،) دەستبەسەر کرد و داوای پەنجا هەزار دیناری لێکردن. باوکی زەکەریا یەحیا کوڕی سەعیدی سوسی (شوشی) لەناو ئەم دەستەیە دەبینرا.

باوکی زەکەریا دەڵێت: ویستم لەمەبەستی ناخی بەجکەم ئاگادار ببمەوە، پەیامێکم بۆ نارد کەنهێنییەکەم هەیە. دەمەوێت نهێنییەکەم ئاشکرا بکەم. منی بانگ کرد. پێم وت: ئەی ئەمیر، ئەگەر دەخوازیت بەکاروباری دنیای ئیسلام و خزمەتی خەلافەت سەرقاڵ بیت و وڵات بەرێوە ببەیت، چۆن بەرەوای دەزانی ئەم خەڵکە ستەم لێکراوە دەستبەسەر بکەیت کەسامانەکانیان لێ سەندراوە و لەسەرزەمینی بێگانە داوای پارەیان لێ بکەیت و فەرمانی سزادانی ئەوان دەربکەیت. دوێنێ فەرمانتدا تەشتێکی پڕ ئاگر لەسەر سکی یەکێك لەوان دابنێن. ئایا نازانی ئەم کارانە بەگوێی خەڵکان دەگاتەوە و دەبێتە هۆی خۆ دوورخستنەوەیان لەتۆ و هەرکەس تۆ بناسێت، دوژمنایەتی تۆ دەگرێتەبەر؟ ئایا ئەو خراپەی لەگەڵ هەموان کردبوو؟ سوێند بەخوا نە، ئەو تەنیا ستەمی لەدەستەیەك کرد بەڵام هەموان رقی ئەویان لەدڵ گرت، خەڵکی بەغدادیش بەم کارانە رازی نابن. من کردەوەکانی مەرداویجم بیری بەجکەم هێنایەوە و کاتێك وتەکانی منی بیست، وتی: راست دەکەیت و چاکەخوازی منیت، دواتر فەرمانی ئازاد کردنی ئەوانیدا.

کاتێك کوڕی بویە و بورەیدی دەستیان بەسەر عەسکەر موکەرەمدا گرت، خەڵکانی ئەهواز دەڕۆشتنە لای بورەیدی و پیرۆزباییان لێدەکرد. لەناو ئەم دەستەیە پزیشکێکی شارەزا دەبینرا. بورەیدی گرفتاری تا و رۆژانەی بەرۆکی دەگرت. رۆژێك بەم پزیشکەی وت: ئەی باوکی زەکەریا، ئایا نەخۆشی و تای من نابینی؟ باوکی زەکەریا پێی وت: خواردنی خۆت تێکەڵ کردووە. بورەیدی پێی وت: پێشتر دنیام تێکەڵ و پێکەڵ و پەرێشان کردووە. هەموویان بەرەو ئەهواز

بەرێکەوتن و سێ و پێنج ڕۆژ لەوێ مانەوە. دواتر بورەیدی لەدەست کوڕی بویە بۆ لای باسیان هەلاّت. کوڕی بویە نامەیەکی بۆ نووسی و سەرکۆنەی کرد و فرت و فێڵەکانی بۆ ئەم هەلاّتنە بیر خستەوە.

هۆکاری هەلاّتنەکەی ئەوە بوو کوڕی بویە داوای سوپاکەی بەسرەی لێکرد تا بۆ لای ڕۆکن ئەلدەولەی برای لەئیسفەهان ڕەوانەیان بکات و تا لەجەنگ دژی وەشمگیر هاوکاری بکەن. بورەیدی چوار هەزار سەربازی بانگ کرد و بەموعیز ئەلدەولەی وت: ئەگەر ئەم سوپایە لەوێ بمێنێتەوە لەنێوان ئەوان و دەیلەمییەکان ناسازگاری ڕوودەدات و باشترە سەرەتا بڕۆنە شوش و لەوێوە ڕێگەی ئیسفەهان بگرنەبەر. موعیز ئەلدەولە مۆڵەتی پێدان و دواتر داوای لەبورەیدی کرد سوپاکەی خۆی لەقەلاّی مەهدی بانگ بکات تا لەرێگەی ڕووبارەوە بەرەو واست، ڕەوانەیان بکات. بورەیدی ترسا ئەو بەلاّی بەسەردا بێنێت کەخۆی بەسەر یاقوتدا هێنای.

دەیلەمییەکان بورەیدیان بەکەسێکی ریسوا دەزانی و گرنگییان پێنەدەدا و بەم شێوەیە بورەیدی هەلاّتنی هەڵبژارد و فەرمانی بەسوپاکەی خۆی لەشوشدا ڕێگەی بەسرە بگرنەبەر. نامەیەکی بۆ موعیز ئەلدەولە نووسی کەوەك بەڵێنێك، کۆکردنەوەی باجی ئەهواز بەو بسپێرێت. ئەو لەعیماد ئەلدەولە کوڕی بویە داوای فەرمانڕەوایەتی ئەهواز و بەسرەی کردبوو تا ساڵانە هەژدە هەزار هەزار درهەم باجی بۆ بنێرێت. موعیز ئەلدەولە لەئەهوازەوە بەرەو عەسکەر موکەرەم ڕۆشت لەترسی ئەوەی نەکا براکەی بڵێت کۆنەکرانەوەی باجی ئەهواز بەهۆی کردەوەکانی تۆوە بووە. بورەیدی ڕۆشتە بەناباز و نوێنەرەکەی خۆی بۆ ئەهواز نارد و نوێنەرێکی بۆ لای موعیز ئەلدەولە ڕەوانە کرد و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری کردەوە و ترسی خۆی لەو نیشاندا و داوای لەموعیز ئەلدەولە کرد عەسکەر موکەرەم بەجێبێڵێت و لەو دوور بکەوێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت لەئەهواز بەئارامی ژیان بەسەر ببات.

باوکی جەعفەری سەیمەری و کەسانی دیکە بەموعیز ئەلدولەیان وت: بورەیدی دەخوازێت ئەو بەلاّت بەسەر بێنێت کەبەسەر یاقوتدا هێنای. ئەو دەیەوێت بلاّوە بەسوپاکەت بکات و دواتر تۆ دەستگیر و بەم شێوەیە خۆی لەبەجکەم و کوڕی

یاقوت نزیك بكاتەوە و بەگرتنی تۆ، براكەت بگەڕێنێتەوە. مۆعیزئەلدەولە لەپۆشتن بۆ شوش خۆی بەدوور گرت و رازی نەبوو.

بەجكەم لەچەند و چۆنی رووداوەكە ئاگادار بوویەوە و دەستەیەك لەسوپاكەی خۆی ڕەوانە كرد و دەستیان بەسەر شوش و جوندیشاپوردا گرت. ئەهواز هێشتا لەژێر فەرمانی بورەیدیدا بوو و لەئاوەدانییەكانی ئەهواز تەنیا عەسكەر موكەرەم لەژێر فەرمانی كوڕی بویە مابوویەوە. بارودۆخی مۆعیزئەلدەولە شڵەژا و دەستەیەك لەسوپاییەكانی لێی جیابوونەوە و مەبەستی گەڕانەوە بۆ فارسیان كرد بەڵام ئیسفەهدوست و موسا قیازە، دوان لەسوپاسالارەكان ڕێگەیان لێ گرتن و بەڵێنی پێدانی ڕۆژانەیان پێدان تا مانگێكی دیكەیش چاوەڕێ بن. ئەوانیش مانەوە.

ئەو بۆ براكەی، عیماد ئەلدەولە نامەیەكی نووسی و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری كردەوە. براكەی سوپایەكی بۆ هاوكاری ئەو ڕەوانە كرد. مۆعێزئەلدەولە بەگەیشتنی ئەم سوپایە بەهێز بوو. ئەو بۆ ئەهواز گەڕایەوە و دەستی بەسەردا گرت و بورەیدی بۆ بەسرە هەڵات و لەوێ مایەوە. كوڕی بویە لەئەهواز ئوردووی لێدا.

بەجكەم لەواست مایەوە و تەماحی زاڵبوون بەسەر بەغداد و شوێن و پێگەی كوڕی رائیقی لەسەردا پەروەردە دەكرد بەڵام كەسی لەمەبەستەكەی خۆی ئاگادار نەدەكردەوە. كوڕی رائیق، عەلی كوڕی خەلەف كوڕی تەیابی بۆ لای بەجكەم نارد تا لەگەڵ ئەو بەرەو ئەهواز بەرێكەوێت و كوڕی بویە لەوێ دەربپەڕێنێت. كاتێك ئەم دەستەیە بەمەبەستەكەی خۆیان گەیشتن، فەرمانڕەوای ئەهواز بۆبەجكەم بێت و عەلی كوڕی خەلەف كاروباری كۆكردنەوەی باج لەئەستۆ بگرێت. كاتێك عەلی گەیشتە لای بەجكەم لەواست، بەجكەم ئەوی وەك وەزیری خۆی هەڵبژارد و خۆی، كۆكردنەوەی سامانەكانی واستی دەستپێكرد.

كاتێك باوكی فەتح، كاروباری بەغدادی بەپەرێشان بینی، تەماحی كۆكردنەوەی باجی میسر و شامی خستە بەردەم كوڕی رائیق و پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەست( كچی پێدا یا كچی لێ خواست) و لەنێوان كوڕی رائیق و كوڕی توغج،

هاوپەیمانی و خزمایەتی دروست کرد و بەکوڕی رائیقی وت: ئەگەر من بۆ میسر و شام ڕەوانە بکەیت، باجی ئەو دیارە بۆ تۆ دەنێرم. کوڕی رائیق فەرمانی کۆکردنەوەی سوپای پێدا. باوکی فەتح ئەو کارەی کرد و لەرەبیع الاوەل/ فەوریە رێگەی ئەو سەرزەمینەی گرتەبەر.

## جەنگی بەجکەم و بورەیدی و ئاشتی دوای جەنگ

کاتێك بەجکەم لەواست مایەوە و پێگەی بەرز و هێزی زیادی کرد، کوڕی رائیق لێی ترسا و کردەوەکانی بەجکەمی بۆ زاڵبوون بەسەر عێراق لێکدایەوە. نامەیەکی بۆ عەبدوڵلەی بورەیدی نووسی و دژی بەجکەم لەگەڵ ئەو پەیمانی بەست کەئەگەر بەجکەم شکستی خوارد، بورەیدی دەست بەسەر واستدا بگرێت و ساڵانە شەشسەد هەزار دینار باجی ئەو سەرزەمینە بنێرێت بەو مەرجەی باوکی عەبدوڵلە سوپایەك ڕەوانە بکات.

بەجکەم لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و ترسا و لەگەڵ هاوەڵانی راوێژی کرد. ئەوان پێشنیاریان کرد سەرەتا لەگەڵ باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی بجەنگێت و هێرش نەکاتە سەر پایتەختی خەلافەت و ئەم مەبەستەی تا کاتی لەناو بردنی بورەیدی لای کوڕی رائیق نەدرکێنێت. بەجکەم سوپاکەی کۆکردەوە و رێگەی بەسرەی گرتەبەر تا لەگەڵ باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی بجەنگێت. باوکی عەبدوڵلەیش سوپایەکی ڕەوانە کرد کەژمارەیان دەهەزار جەنگاوەر بوو. کۆیلەکەی، باوکی جەعفەر محەممەدی حەماڵ فەرماندەیی ئەوانی گرتەدەست. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و جەنگ هەڵگیرسا و سوپاکەی بورەیدی شکستی خوارد. بەجکەم شوێن هەڵاتوان نەکەوت و دەستی لێ هەڵگرتن.

سوپاکەی بورەیدی لەمەتارا چاوەڕوانی سوپا بوون و کاتێك سوپاکەیان بەتێکشکاو بینی، ترسان و وەرەی خۆیان دۆڕاند. بەڵام کاتێك بورەیدی بینی سوپاکەی بێ زیان گەڕاونەتەوە و کەس لەوان نەخنکاوە، ئارامی گرت.

بەجکەم دەیویست بورەیدی بەفەرمانبەری ناچار بکات و پەیوەندی ئەو لەگەڵ کوڕی رائیق بپچڕێنێت چوونکە دەیویست دەست بەسەر بەغداد بگرێت. بەجکەم

لەدووەم ڕۆژی شکستی بورەیدی نوێنەرێکی بۆ لای ئەو نارد و بۆ ئەم ڕووداوە خەم و پەژارەی خۆی دەربڕی و وتی: خۆت دەستت پێکرد و لەبەرابەر من وەستایت، من لەتۆ و هاوەڵانت چاوپۆشیم کرد و ئەگەر شوێن سوپاکەت دەکەوتم، زۆربەیان دەخنکان یا دەکوژران. من لەسەر ئەو بنەمایە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تۆ دەبەستم کە لەئەگەری دەست گرتن بەسەر بەغداد واست بخەمە ژێر فەرمانی تۆ و پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ تۆ ببەستم. بورەیدی بۆ سپاس کردن سەری لەخاك سوو و سوێندی بۆ بەجکەم خوارد و پەیمانی ئاشتی لەنێوان ئەوان واژۆ کرا. بەجکەم بۆ واست گەڕایەوە و بیری لەگرتنی بەغداد دەکردەوە.

## بڕینی دەست و زمانی کوڕی موقلە

لەنیوەی شەوال/ شانزەی ئۆگۆستی ئەم ساڵەی دەستی وەزیر، باوکی عەلی کوڕی موقلەیان بڕی.

چۆنیەتی بڕینی دەستی بەم شێوە بوو کاتێك باوکی فەتح کوڕی جەعفەر کوڕی فورات بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری وەزارەت ناتەوان و بەرەو شام بەرێکەوت، خەلیفە ڕازی، باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەك وەزیر دەستنیشان کرد. ئەویش ناتەوان و کوڕی ڕائیق کاروبارەکانی ڕادەپەڕاند. کوڕی ڕائیق دەستی بەسەر هەموو زەوییەکانی کوڕی موقلە و کوڕەکەی گرتبوو. کوڕی موقلە لەمبارەوە گفتوگۆی لەگەڵ کرد بەڵام کوڕی ڕائیق هیچی بۆ نەگەڕاندەوە. کوڕی موقلە ڕێزی لەهاوەڵانی ئەو گرت و داوای لێکردن سەبارەت بەگەڕاندنەوەی زەوییەکانی لەگەڵ کوڕی ڕائیق قسە بکەن. ئەوانیش بەڵێنیان پێدا بەڵام نەیانبردەسەر. کوڕی موقلە کاتێك ئەمەی بینی، تۆمەتی بۆ کوڕی ڕائیق هەڵبەست و خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان. نامەیەکی بۆ بەجکەم نووسی و تەماحی شوێنەکەی کوڕی ڕائیقی خستە بەردەست. کوڕی موقلە بۆ وەشمگیر لەڕەی نامەیەکی نووسی، نامەیەکی بۆ خەلیفە ڕازی نارد و پێشنیاری پێکرد کوڕی ڕائیق و هاوەڵانی ئەو دەست بەسەر بکات. کوڕی موقلە بەڵێنیدا سێ هەزار هەزار دیناریان لێ بستێنێت. ئەو داوای لەڕازی کرد بەجکەم بۆ لای خۆی بانگ بکات و پێگەی کوڕی ڕائیقی پێ

ببەخشێت. رازی کەبەم کارە رازی نەبوو، هیوای بەکوڕی موقلە بەخشی وئەو بەخێرایی نامەیەکی بۆ بەجکەم نووسی و لەرەزامەندی رازی ئاگاداری کردەوە و ئەوی بۆ هاتن بۆ بەغداد هاندا.

کوڕی موقلە داوای لەخەلیفە کرد بۆ ئەنجامدانی ئەوەی لەسەری رێککەوتن بڕواتە کۆشکی خەلافەت. رازی مۆڵەتی پێداو ئەو لەدووایین شەوی رەمەزان/ دووی ئۆگۆست بەشێوەیەکی نەناسراو مەبەستی کۆشکی خەلیفەی کرد و بەخۆی وت: مانگ هێشتا بەتەواوی هەڵنەهاتووە و بۆ ئەنجامدانی کارە نهێنییەکان کاتێکی گونجاوە. سزاکەی ئەوە بوو پشتی بەمانگ بەست نەك بەخوا لەبەر ئەمە نهێنییەکەی ئاشکرا بوو. کاتێك گەیشتە کۆشکی خەلیفە، رازی مۆڵەتی بینینی پێنەدا و لەژوورێکدا زیندانی کرد و بۆ بەیانی کەسی بۆ لای کوڕی رائیق نارد و لەرووداوەکە ئاگاداری کردەوە و نامەکەی کوڕی موقلەی نیشاندا. کوڕی رائیق سپاسی خەلیفەی کرد. پەیك و پەیام لەنێوان کوڕی موقلە و خەلیفە تا نیوەی شەوال/ شانزەی ئۆگۆست بەردەوام بوو تا ئەوەی کوڕی موقلەیان هێنایەدەر و دەستیان بڕییەوە. ئەو دەستە بڕاوەکەی تیمار کرد و دووبارە نامەی بۆ خەلیفە نووسی و خوازیاری وەزارەت بوو. وتی: بڕینی دەستی ئەو لەگەیشتن بەمەبەستەکەی دوور ناخاتەوە و بەهەمان دەستی بڕاو پێنوس هەڵدەگرێت و پێی دەنووسێت.

کاتێك بەجکەم لەبەغداد نزیك کەوتەوە، کوڕی موقلە لەخزمەتکارەکانی بارەگا بیستی کەسەبارەت بەهێرشی ئەو دەدوان. بەخۆی وت: ئەگەر بەجکەم بگاتە بەغداد، رزگارم دەکات و ئەوسا، سزای کوڕی رائیق دەدەم. ئەو نفرینی ئەو کەسانەی کرد دەستیان بڕیبوو. هەواڵی ئەو بەکوڕی رائیق و خەلیفە گەیشت و هەردووك فەرمانی بڕینی زمانی ئەویان دەرکرد و دواتر خستیانە زیندانێکی تەنگ و تاریك. کوڕی موقلە لەزیندان گرفتاری سك ئێشە بوو. کەس نەبوو خزمەتی بکات تا ئەو جێگەی بەدەستی چەپی ئاوی لەچاڵ هەڵدەکێشا و تەنافەکەی بەدەمی دەگرت و بەرادەیەك بەدبەخت و ناتەوان ببوو کەمرد و لەکۆشکی خەلیفە بەخاك سپێردرا. دواتر بنەماڵەکەی خوازیاری جەنازەکەی بوون. گۆڕەکەیان

هەڵکەند و جەنازەی بێ گیانی ئەویان بۆ بنەماڵەکەی گەڕاندەوە و ئەوان لەناو ماڵەکەیان بەخاکیان سپارد و دووبارە گۆڕەکەی هەڵدڕایەوە و لەماڵێکی دیکە بەخاك سپێردرا.

سەرسوڕهێنەر ئەوەی کوڕی موقلە سێ جار وەك وەزیر هەڵبژێردرا و وەزیری سێ خەلیفە بوو و سێ جار سەفەری کرد. دوو جار بۆ شیراز دوورخرایەوە و جارێك لەسەردەمی وەزارەت، رووی کردە موسڵ ودوای مەرگ سێ جار بەخاك سپێردرا و سێ خزمەتکاری تایبەت، خزمەتیان دەکرد.

## زاڵبوونی بەجکەم لەبەغداد

لەم ساڵەدا بەجکەم هاتە ناو بەغداد و چاوی بەخەلیفە کەوت و لەجێگەی کوڕی رائیق، وەك ئەمیری ئەمیرەکان دەستنیشان کرا. ئێمە سەرەتای کاری بەجکەم و چۆنیەتی گەیشتن بەم پێگەیە باس دەکەین هەرچەند ئاماژەمان بەبەشێك لەرووداوەکانی ئەو داوە بەڵام لەبەر ئەوەی بەش بەش و پچڕ پچڕ باسمان کردووە، نیازی ئێمە دابین ناکات.

کوڕی بەجکەم لەکۆیلەکانی باوکی عەلی عارز، وەزیری ماکان کوڕی کالی دەیلەمی بوو. ماکان داوای ئەوی لەعارز کرد و عارز، بەجکەمی پێبەخشی. دواتر بەجکەم لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەماکان جیابوویەو ی پەیوەستی مەرداویج بوون. ئەو لەناو ئەو کەسانەدا دەبینرا کەمەرداویجیان کوشت و دواتر رێگەی عێراقی گرتەبەر و پەیوەستی کوڕی رائیق بوو. کوڕی رائیق ئەوی بۆ ئەهواز نارد و ئەو، دەستی بەسەر ئەهوازدا گرت و بورەیدی لەوێ دەرپەڕاند.

دواتر بورەیدی لەگەڵ مۆعیز ئەلدەولە کوڕی بویە لەفارسەوە رێگەی ئەهوازیان گرتەبەر و بەجکەمیان لەوێ دەرپەڕاند و بەجکەم لەئەهوازەوە، بەرەو واست بەرێکەوت. ئێمە پێشتر ئاماژەمان بەمە دا. کاتێك بەجکەم لەواست جێگیر بوو، تەماحی زاڵبوون بەسەر پایتەختی خەلیفەی کەوتەسەر بەڵام وای نیشان دەدا شوێنکەوتەی کوڕی رائیقە و لەسەر ئاڵا و قەڵغانەکانی خۆی ناوی (بەجکەمی رائیقی) نووسیبوو. کاتێك نامەکانی کوڕی موقلەی بەدەست گەیشت کەپێشنیاری

بەخەلیفە کردبوو پێگەی کوڕی رائیقی پێبەخشێت، بەجکەم چاوی تەماحی کرایەوە و ئەمەی لەگەڵ کوڕی رائیق باس کرد و ناوی ئەوی لەسەر ئاڵاکانی خۆی سڕییەوە و لەسەرەتای زیقەعدە/ سی ئۆگۆست لەواستەوە رێگەی بەغدادی گرتەبەر.

کوڕی رائیق بۆ بەرگری کردن خۆی ئامادە و داوای لەخەلیفە کرد فەرمان نامەیەك بۆ بەجکەم بنووسێت و فەرمانی گەڕانەوە بۆ واستی پێبدات. خەلیفە ئەو نامەی نووسی و نامەکەی ڕەوانە کرد. کاتێك بەجکەم نامەکەی بینی، خوێندییەوە و فڕیدا و پێشڕەوی کرد تا گەیشتە رۆژهەڵاتی رووباری دیالە. سوپاکەی کوڕی رائیق لەرۆژئاوای ئەم رووبارە بوون. سوپای بەجکەم خۆیان لەئاودا و سوپای کوڕی رائیق هەڵاتن. سوپای بەجکەم پەڕییەوە و رێگەی بەغدادیان گرتەبەر. کوڕی رائیق لەبەغداوە بەرەو عوکبرا بەرێکەوت و بەجکەم لەسیانزەی زیقەعدە/ سیانزەی سێپتامبەر ڕۆشتە ناو بەغداد و بەیانی ئەو رۆژە چاوی بەخەلیفە کەوت. رازی خەڵاتی پێبەخشی و ئەوی کردە ئەمیری ئەمیرەکان. رازی چەندین نامەی بۆ سەرکردەکانی هاورێی کوڕی رائیق نووسی و فەرمانی گەڕانەوە بۆ بەغدادی پێدان. ئەوانیش هەموویان کوڕی رائیقیان بەجێهێشت و ئەسپەکانی خۆیان بۆ گەڕانەوە بۆ بەغداد تاودا.

کاتێك کوڕی رائیق ئەم بارودۆخەی بینی، خۆی گەیاندە بەغداد و لەوێ خۆی شاردەوە. بەجکەم لەکۆشکی مونس دابەزی و کاروباری بەغدادی سەقامگیر کرد. ئەبوبەکر کوڕی رائیق بۆ ماوەی یەك ساڵ و دە مانگ و شەش رۆژ ئەمیری ئەمیرەکان بوو. یەکێك لەفێڵەکانی بەجکەم ئەوە بوو بەداڕشتنی باوکی زەکەریا یەحیا کوڕی سەعیدی شوشی نامەی بۆ کوڕی رائیق دەنووسی. باوکی زەکەریا دەڵێت: پێشنیارم بەبەجکەم کرد کوڕی رائیق لەنهێنییەکەی خۆی ئاگادار نەکاتەوە. وتی: بۆ ئەو پێشنیارەم پێدەکەیت؟ وتم: چوونکە فەرماندەی تۆیە و لەتۆ بەهێزترە و سوپاکەی لەسوپای تۆ فراوانتر و خەلیفەی لەگەڵدایە و سامانێکی زیاتری لەبەردەستایە. بەجکەم وتی: جەنگاوەرەکانی ئەو وەك قامیشی ناو بەتاڵن و من ئەزموونم لەگەڵ ئەوان هەیە و ترسم لێیان نییە چ ژمارەیان زیاتر

بێت چ کەمتر، بەڵام ئەوەی دەڵێی خەلیفە لەگەڵ ئەودایە، بەبوونی هاوەڵانم خەلیفە زیان لەمن نادات، ئەوەی دەڵێی توێشوو و توانای لەمن زیاترە، دەبێت بڵێم رۆژانەی سوپاکەم بەتەواوی داوە و سامانی خۆمم هەیە، گومان دەکەیت سامانی من چەندە بێت؟ وتم: نازانم. وتی: شتێك بڵێ. وتم: سەد هەزار درهەم. وتی: خوا بتبەخشێت، پەنجا هەزار دینار کەنیازم پێی نییە.

کاتێك بەجکەم دەستی بەسەر بەغداد گرت، رۆژێك پێی وتم: ئایا بیرتە پێم وتی پەنجا هەزار دینارم هەیە و نیازم پێی نییە؟ وتم: بەڵێ. وتی سوێند بەخوا لەو رۆژەدا پێنج هەزار درهەمم هەبوو. وتم: ئەوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی من بەکەسێکی بڕواپێکراوی خۆت نازانیت. وتی: نا، بەڵام تۆ نوێنەری من لای کوڕی رائیق بوویت و ئەگەر لەنەداری من ئاگادار دەبوویت، ورەت دەڕووخا و دوژمن چاوی تەماحی دەبڕییە ئێمە. دەمویست بەدڵێکی بەهێز و ئەرخەیان بڕۆیتە لای کوڕی رائیق تا بەوتەکانی خۆت ورەی ئەو بڕوخێنیت. باوکی زەکەریا دەڵێت: لەفرت و فێڵ و ئاوزی ئەو سەرم سوڕما.

## زاڵبوونی لەشکری لەئازەربایەجان و کوژرانی ئەو

لەم ساڵەدا لەشکری کوڕی مەردی دەستی بەسەر ئازەربایەجاندا گرت. ئەم لەشکرییە لەو لەشکرییەی پێشتر ئاماژەمان پێدا، بە ...تر بوو. ئەم نوێنەری وەشمگیر لەسنوری چیاکان بوو. لەشکری توێشوو و هیزی کۆکردەوە و رێگەی ئازەربایەجانی گرتەبەر. لەم کاتەدا دەیسەم کوڕی ئیبراهیمی کوردی، لەهاوەڵانی کوڕی باوکی ساج، فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجانی دەکرد. ئەویش سوپای کۆکردەوە و رووبەرووی لەشکری بوویەوە. سەرئەنجام دەیسەم شکستی خوارد بەڵام گەڕایەوە و دووبارە سوپای کۆکردەوە و جارێکی دیکە دوو سوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەست بەڵام دووبارە دەیسەم شکستی خوارد و لەشکری دەستی بەسەر سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەودا گرت (جگە لەئەردەبیل) چوونکە خەڵکی ئەم شارە بەهۆی قەڵا بەهێزەکەیەوە رێگەیان نەدا لەشکری شارەکەیان داگیر بکات و بەرگرییان لێکرد. خەڵکانی ئەردەبیل، کەسانێکی بوێر و خۆڕاگر بوون. لەو کاتەدا

ئەردەبیل بەپایتەختی ئازەربایەجان دادەنرا. لەشکری نامەی بۆ خەڵکانی ئەردەبیل نووسی و بەڵێنی چاکەکاری پێدان چوونکە دەیلەمییەکان خراپەکارییان لەگەڵ دانیشتوانی چیاکانی هەمەدان و شوێنەکانی دیکە کردبوو. لەشکری گەمارۆی خستە سەریان و ئەم گەمارۆیە ماوەیەك درێژەی کێشا تا ئەوەی سوپاکەی بەدیواری شارەکەدا سەرکەوتن و چەند کەلێنێکیان تیا دروست کرد و هەندێ کات دەڕۆشتنە ناو شارەکە.

لەشکری ڕۆژانە دەڕۆشتە ناو شارەکە و شەوانە بۆ لەشکرگەکەی خۆی دەگەڕایەوە. دانیشتوانی شار بەهەوڵی زۆر کەلێنەکانیان گرت و دووبارە جەنگ دەستی پێکردەوە. لەشکری پەشیمان بوویەوە لەبەر ئەوەی کەمتەرخەمی کرد. خەڵکانی ئەردەبیل نامەیان بۆ دەیسەم نووسی و لەبارودۆخی خۆیان ئاگاداریان کردەوە و ڕۆژێکیان دیاریکرد تا لەگەڵ سوپاکەی بێت و خەڵکانی ئەردەبیل لەو ڕۆژەدا بێنەدەر و جەنگ لەگەڵ سوپای لەشکری دەست پێبکەن و دەیسەم لەپشتەوە هێرشیان بکاتەسەر. دەیسەم ئەو کارەی کرد و ئەسپی غاردا. ئەردەبیلییەکان لەڕۆژی دیاریکراو سوپایەکیان ڕازاندەوە و جەنگیان دەست پێکرد و دەیسەم لەپشتەوە هێرشی کردە سەر سوپاکەی لەشکری. لەشکری ریسوایانە شکستی خوارد و ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپاکەی کوژران. لەشکری بۆ موقان هەڵات و سوپاسالاری ئەو دیارە، ناسراو بەکوڕی دوله، ڕێزی لێگرت.

لەشکری سوپایەکی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر دەیسەم. کوڕی دوله هاوکاری کرد. دەیسەم هەڵات و لەڕووبارەی ئەرس (ئاراس) پەڕییەوە و دەستەیەك لەسوپاکەی لەشکری خۆیان پێگەیاند. دەیسەم هەڵات و مەبەستی پەیوەست بوون بەوەشمگیری کرد. وەشمگیر لەم کاتەدا لەڕەی بوو. دەیسەم ئەوی لەلەشکری ترساند و بەڵێنیدا ساڵانە بڕێکی دیاریکراو پارەی پێبدات تا سوپایەکی بکاتە هاوڕێ. وەشمگیر ڕازی بوو و سوپایەکی لەگەڵدا نارد. سوپای لەشکری نامەیان بۆ وەشمگیر نووسی کەهەرکات سوپاکەی ئەو ببینن، سوپای لەشکری بەجێدێڵن و پەیوەستی سوپاکەی ئەو دەبن. لەشکری ئەم نامەنای گرت بەڵام هیچی نەوت. کاتێك سوپای وەشمگیر نزیك بوویەوە، هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و پێی وتن

کەتوانای ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای وەشمگیری نییە و دەیەوێت سوپاکەی خۆی بەرەو زوزان ببات و لەرێگە، سامانی ئەرمەنییەکان تالآن بکات و دواتر رێگەی موسڵ بگرێتەبەر و دەست بەسەر ئەو سەرزەمینانەدا بگرێت. سوپا بەمە رازی بوون و ئەو سوپاکەی بەرەو ئەرمەنستان برد بێ ئەوەی ئەرمەنەکان ئاگادار بن. لەشکری تا توانی تالآنی کۆکردەوە و ئەسیری کرد و لەگەڵ تالآنییە فراوان گەیشتە زوزان. ئەو لەسنوری سەرکردەیەکی ئەرمەنی ئوردووی لێدا. ئەم سەرکردەیە پارەی بەلەشکریدا تا چاوپۆشی لەتالآن کردنی سەرزەمینەکەی بکات. لەشکری رازی بوو.

ئەم سەرکردە ئەرمەنییە فەرمانی بۆسە نانەوەی لەدۆڵێك بەچەند ئەرەمەنییەك دا و فەرمانی پێدان بەشێك لەسامانەکەی لەشکری تالآن بکەن و بۆ دۆڵەکە هەڵبێن. ئەوانیش ئەو کارەیان کرد. لەشکری لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە. ئەو لەگەڵ پێنج کەس بەرێکەوت و خۆی لەدوای ئەوانەوە رێگەی دەبڕی تا ئەوەی ئەو چەند کەسە هێرشیان کردەسەر و لەگەڵ هاورێکانی، کوشتیان. سوپای لەشکری خۆیان گەیاندە ئەوان و بینیان هەموویان کوژراون. ئەوان گەڕانەوە و کوڕی لەشکرییان بەناوی لەشکرستان کردە فەرماندەی خۆیان و بڕیاریاندا لەگەردەنەی تەنین (ئەژدیها) گوزەر بکەن. ئەم گەردەنەیە بەکێوی جودی[٢٣] تێپەڕی دەکرد. ئەوان دەیانویست دەست بەسەر کەنارەکانی ئەرمەنستاندا بگرن و دواتر لەوێوە هێرش بکەنە سەر سنوری تەرەمی ئەرمەنی و تۆڵەی لێ بستێنن. تەرەم لەم مەبەستە ئاگادار بوویەوە و پیاوەکانی خۆی لەدۆڵەکانی ئەو ناوچە حەشاردا تا بەرد بەسەر سوپاکەی لەشکری ببارێنن و رێگەی گوزەر کردنیان لێ بگرن. بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی لەشکری کوژران و تەنیا کەمێکیان گیانیان دەرباز کرد. لەشکرستان لەو کەسانە بوو زیانی بەرنەکەوت. ئەو لەگەڵ هاوەڵانی بۆ پەیوەست بوون بەناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان، رێگەی موسڵی گرتەبەر. دەستەیەك لای ناسر ئەلدەولە مانەوە و دەستەیەك رێگەی بەغدادیان گرتەبەر.

---

[٢٣]- جودی یا جودی داغ ، چیایەکی بەرزە لەویلایەتی بوهتان لەبەشی ئاسیایی تورکیە، بەرزاییەکەی دەگاتە چوار هەزار مەتر و ناوبانگی لەبەر ئەوەیە دەڵێن کەشتی نوح لەوێ نیشتەوە. وەرگێر.

ناسرئەلدەولە، ئەوانەی لەموسڵ مابوونەوە لەگەڵ کوڕە مامەکەی خۆی، باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی سەعید کوڕی حەمدان بەرەو ئازەربایەجان ڕەوانە کرد چوونکە دەیسەم رووی کردبووە ئەو سەرزەمینە و دەیویست دەستی بەسەردا بگرێت. باوکی عەبدوللە لەلایەن کوڕە مامەکەی خۆی، ناسر ئەلدەولە، ئۆدەداری کۆکردنەوەی خواردەمەنی ئازەربایەجان بوو. دەیسەم مەبەستی رووبەروو بوونەوەی باوکی عەبدوللەی کرد و کوڕی حەمدان نەیتوانی لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکات و ئازەربایەجانی بەجێهێشت و دەیسەم ئەو سنوری خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

## تێکچوونی بارودۆخی قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا کاروباری قەرەمتییەکان پەرێشانی بەخۆیەوە بینی و سەرقاڵی کوشتاری یەکتر بوون.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو پیاوێك بەناوی کوڕی سەنبەر لەکەسە نزیك و رازدارەکانی باوکی سەعیدی قەرەمتی، دوژمنێکی بوو لەقەرەمتییەکان بەناوی باوکی حەفسی شەریك. کوڕی سەنبەر ڕۆشتە لای پیاوێکی ئیسفەهانی و پێی وت: ئەگەر دوژمنەکەی من، باوکی حەفس بکوژیت، کاروباری قەرەمتییەکان بەتۆ دەسپێرم. ئەو پیاوە رازی و لەگەڵ کوڕی سەنبەر پەیمانی بەست. کوڕی سەنبەر راز و نهێنییەکانی باوکی سەعیدی فێری ئەو پیاوە ئیسفەهانییە کرد و لەنیشانەکانی دەرکەوتن ئاگاداری کردەوە. ئەو ڕۆشتە لای مناڵەکانی باوکی سەعید و نیشانەکانی دەرکەوتنی هێنایە سەرزمان. باوکی تاهیر (فەرماندەی قەرەمتییەکان و مناڵی باوکی سەعید) وتی: ئەو ئیمامەی بانگەشەی بۆ دەکەین ئەوەیە. هەموان ملکەچی فەرمانەکانی بوون تا ئەو جێگەی ئەگەر فەرمانی بەکەسێك دەدا براکەی خۆی بکوژێت، دەیکوشت و ئەگەر کەسێکی خۆش نەدەویست دەیوت فلانەکەس نەخۆشە. ئەم وتەیە بەمانای ئەوە بوو گومان لەباوەڕی ئەو کەسە دەکات و فەرمانی کوشتنی ئەوی دەدا.

باوکی تاهیر ئاگادار بوویەوە کەپیاوی ئیسفەهانی مەبەستی کوشتنی ئەوی

لەسەردایە بۆ ئەوەی بەتەنیایی فەرمانڕەوایەتی بکات. باوکی تاهیر بەبراکانی وت: سەبارەت بەم پیاوە بەهەڵەدا چووین و بەم زووانە نهێنی لەسەر کار و مەبەستەکانی ئەو هەڵدەگرین. ڕۆژێك باوکی تاهیر بەپیاوی ئیسفەهانی وت: نەخۆشێکمان هەیە، سەیری بکە بۆ ئەوەی چاك ببێتەوە. ئەوسا دایکی خۆیان لەسەر جێگە خەواند و دایانپۆشی. کاتێك ئیسفەهانی سەیری جێگەی نەخۆشەکەی کرد، وتی: ئەم نەخۆشە چاك نابێتەوە، بیکوژن. وتیان: درۆت کرد، ئەوە دایکی ئێمەیە. پیاوی ئیسفەهانی و ژمارەیەکی زۆر لەشوێنکەوتە و لایەنگرانی ئەویان کوشت و ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەهەجەر بمێننەوە و مەبەستی تالآن کردن و خراپەکاری لەهیچ شارێك نەکەن.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەزیقەعدە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە لەنێوان ڕۆمییەکان و موسوڵمانەکان ئەسیرەکان ئاڵ و گۆڕ کران. کوڕی وەرقای شەیبانی ئۆدەداری ئەم کارە بوو. لەم ئاڵ و گۆڕەدا زیاتر لەشەش هەزار و سێسەد پیاو و ژنی موسوڵمان ئازاد کران. شوێنی ئەم ئاڵ و گۆڕە کەنار ڕووباری بەدەندون بوو.

لەم ساڵەدا باوکی قاسم ئیسماعیل کوڕی عیباد چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و حەوتی کۆچی ( ٩٣٨و٩٣٩ زایینی )

### ڕۆشتنی خەلیفە رازی و بەجکەم بۆ موسڵ و دەرکەوتنی کوڕی رائیق و ڕۆشتنی ئەو بۆ شام

لەموحەرەم/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە خەلیفە رازی و بەجکەم بەرەو موسڵ و دیاری رەبیعە بەرێکەوتن.

هۆکارەکەی ئەم بوو ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان لەناردنی باجی سنوورەکانی ژێر دەستی کەمتەرخەمی دەکرد. رازی توڕە بوو و لەگەڵ بەجکەم بەرەو موسڵ بەرێکەوت. قازی قازییەکان باوکی حسەین عومەر کوڕی محەممەد هاوڕێیەتی ئەم دوانەی دەکرد. کاتێك گەیشتنە تکریت، رازی مایەوە و بەجکەم درێژەی بەرێگەدا. ناسرئەلدەولە لەکوحەیل، شەش فەرسەنگی موسڵ، ڕووبەرووی بەجکەم بوویەوە و شەڕ دەستیپێکرد. سوپاکەی ناسرئەلدەولە شکستی خوارد و بۆ نەسیبین هەڵاتن و بەجکەم بێ ئەوەی بۆ موسڵ بگەڕێتەوە، شوێنیان کەوت.

کاتێك بەجکەم گەیشتە نەسیبین، کوڕی حەمدان ڕۆشتە دیاربەکر. بەجکەم هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بۆ رازی نووسی و خەلیفە بەکەشتی، تکریتی بەرەو موسڵ بەجێهێشت. دەستەیەك لەقەرەمتییەکان هاوڕێیەتی خەلیفەیان دەکرد کەپێش گەیشتنی نامەکەی بەجکەم ڕێگەی بەغدادیان گرتبووە بەر. کوڕی رائیق نامەی بۆ ئەوان دەنووسی. کاتێك قەرەمتییەکان گەیشتنە بەغداد، کوڕی رائیق لەشوێنی خۆ شاردنەوەی هاتەدەر و دەستی بەسەر بەغداد گرت بەڵام دەستدرێژی نەکردە سەر کۆشکی خەلیفە.

خەلیفە لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە و لەئاو، هاتە سەر وشکانی و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر. بەجکەمی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە و ئەو لەنەسیبین گەڕایەوە. کاتێك هەواڵی گەڕانەوەی ئەو بەناسر ئەلدەولە گەیشت، لەدیاربەکرەوە ڕێگەی نەسیبینی گرتەبەر و ئەو سامانە و دیاری رەبیعەی خستە ژێر دەستی خۆی. بەجکەم نیگەران و هاوەڵانی دەستە دەستە و خۆسەرانە ڕێگەی بەغدادیان

گرتەبەر. پێویستی بەوە بوو ڕێگە لەهاوەڵانی بگرێت و لەبەر ئەمە بەهاوەڵانی خۆی وت: خەلیفە و ئەمیری ئەمیرەکان بەوەی تەنیا دەستیان بەسەر موسڵدا گرتووە، بەسندە دەکەن.

کوڕی حەمدان پێش ئەوەی لەپێشهاتەکەی کوڕی رائیق ئاگادار ببێتەوە، نامەیەکی بۆ خەلیفە و بەجکەم نارد و پێنسەد هەزار دیناری بەپەیکەکەدا ڕەوانە کرد و خوازیاری ئاشتی بوو. بەجکەم شادمان و خەلیفەی لەمە ئاگادار کردەوە. خەلیفەیش رازی بوو و لەنێوان ئەوان و کوڕی حەمدان ئاشتی سەقامگیر بوو. رازی و بەجکەم بەخێرایی بۆ بەغداد گەڕانەوە. کوڕی رائیق نامەی بۆ باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی یەحیا و کوڕی شێرزاد نووسی و خوازیاری ئاشتی لەگەڵ خەلیفە بوو. باوکی جەعفەر ڕۆشتە موسڵ بۆ لای ئەوان و نامەی کوڕی رائیقی تەسلیم بەبەجکەم کرد. بەجکەم ڕێزی گرت و ئەوی کردە میوانی خۆی و دواتر بردی بۆ لای خەلیفە و نامەکی کوڕی رائیقی نیشاندا. رازی و بەجکەم بەخواستی کوڕی رائیق رازی بوون و قازی قازییەکان، باوکی حسەین عومەر کوڕی محەممەد، وەڵامی نامەکەی ئەوی دایەوە و ڕێگەی فورات و دیاری موزێر، حەران، ڕۆها و کەنارەکانی ئەو سەرزەمینە و سوپای قێنسرین و پایتەختەکانی خستە ژێر فەرمانی کوڕی رائیق. کوڕی رائیق رازی و لەبەغدادەوە بەرەو سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی بەڕێکەوت و رازی و خەلیفە لەنۆی ڕەبیع الاخر/ چواردەی فەوریە هاتنە ناو بەغداد.

## وەزارەتی بورەیدی

لەم ساڵەدا باوکی فەتح فەزڵ کوڕی جەعفەر کوڕی فوراتی وەزیر لەڕەملە مرد و پێشتر وتمان بۆ ئەو بەرەو شام بەرێکەوت. وەزارەتی ئەو یەك ساڵ و هەشت مانگ و بیست و پێنج ڕۆژ درێژەی کێشا. کاتێك ئەو بەرەو شام بەرێکەوت، عەبدوللە کوڕی عەلی نوقوری لەدەرباری خەلیفە وەك نوێنەر و جێنشینی خۆی دەستنیشان کرد. بەجکەم وەزیرەکەی خۆی، عەلی کوڕی خەلەف کوڕی تەیابی گرت و باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی شێرزادی وەك وەزیر هەڵبژارد. باوکی

جەعفەر هەوڵیدا لەنێوان بەجکەم و بورەیدی ئاشتی سەقامگیر بکات و کردی: بورەیدی بەفەرمانڕەوایەتی واست رازی بوو و بەڵێنیدا ساڵانە شەشسەد هەزار دینار باج بدات. دواتر کوڕی شێرزاد (وەزیری بەجکەم) بەدوای مەرگی باوکی فەتحی وەزیر لەرەملە هەوڵیدا باوکی عەبدوللەی بورەیدی وەك وەزیری خەلیفە دەستنیشان بکات. رازی نامەیەکی بۆ بورەیدی نووسی و ئەو لەرەجەب/ ئاوریل بەوەزارەتی خەلیفە رازی، رازی بوو و عەبدوللە کوڕی عەلی نوقوری وەك نوێنەری خۆی لەدەرباری خەلیفە دەستنیشان کرد.

## ناسازگاری خەلیفە و باڵبا

بەجکەم یەکێك لە سەرکردە تورکەکانی خۆی بەناوی باڵبا وەك نوێنەری خۆی لەئەنبار دیاریکرد. ئەو نامەیەکی بۆ بەجکەم نووسی و داوای لێکرد کەنارەکانی رێگەی فورات بەوبسپێرێت تا لەبەرابەر کوڕی رائیق جێگیر ببێت. لەم کاتەدا بەجکەم لەشام بوو. بەجکەم فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەی پێ سپارد. لەم کاتەدا باڵبا رێگەی رەحبەی گرتەبەر و نامەی بۆ کوڕی رائیق نووسی و رێگەی ناسازگاری خەلیفە و بەجکەمی گرتەبەر و پێشنیاری پەیوەست بوون بەکوڕی رائیقی بەخەڵکان دەکرد و پێگەی بەرز بوویەوە.

بەجکەم لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و دەستەیەك لەسوپاییەکانی خۆی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان بەخێرایی رێگە ببڕن و پێش ئەوەی کارگوزارەکەی بگاتە رەحبە، بگەنە ئەو سەرزەمینە و لەوێ سەرکوتی بکەن. سوپاییەکان ئەو کارەی کرد و لەماوەی پێنج رۆژ خۆیان گەیاندە رەحبە و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەر باڵبا کەسەرقاڵی دروست کردنی خواردن بوون. کاتێك باڵبا ئاگادار بوویەوە، لای جوڵایەك خۆی شاردەوە بەڵام سەرئەنجام گرتیان و سوار لەسەر وشتر ڕەوانەی بەغدادیان کرد. لەوێ زیندانی کرا و بەم شێوەیە کۆتایی بەکار و ژیانی هات.

## فەرمانڕەوای باوکی عەلی کوڕی موحتاج لەخوراسان

لەم ساڵەدا ئەمیر سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد، باوکی عەلی کوڕی ئەبی بەکر کوڕی موزەفەر کوڕی موحتاجی کردە فەرمانڕەوای خوراسان و فەرماندەی سوپای خوراسان. باوکی ئەوی لەسەر کار لابرد و ئەوی بۆ بوخارا گەڕاندەوە.

هۆکاری ئەم کارە ئەوە بوو باوکی ئەو نەخۆش و نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا. سەعید کەسی نارد و کوڕەکەی ئەو باوکی عەلی لەسەغانییان بانگ کردەوە و ئەوی بۆ گرتنەوەی جێگەی باوکی دەستنیشان و بەرەو نەیشابوری نارد. نامەیەکی بۆ باوکی نووسی و بۆ لای خۆی بانگی کردەوە. باوك لەنەیشابورەوە بەرێکەوت و لەسێ مەنزڵی نەیشابور، چاوی بەکوڕەکەی کەوت و کوڕەکەی لەوەی دەبوا، لێی ئاگادار بێت، ئاگادار کردەوە. ئەبوبەکری نەخۆش ڕۆشتە بوخارا و کوڕەکەی هاوشێوەی فەرمانڕەوا لەرەمەزان/ جونی ئەم ساڵە ڕۆشتە نەیشابور.

باوکی عەلی پیاوێکی بیرمەند، بوێر و دوورئەندێش بوو. ئەو سێ مانگ لەنەیشابور مایەوە و خۆی بۆ هێرش کردنە سەر جورجان و تەبەرستان ئامادە کرد و چەند و چۆنی ئەم هێرشە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٣٢٨/٩٤٠ زایینی ئاماژەی پێدەدەین.

## زاڵبوونی وەشمگیر لەئیسفەهان و ئەلەموت

لەم ساڵەدا وەشمگیر کوڕی زیار برای مەرداویج سوپایەکی گەورەی لەرەی بەرەو ئیسفەهان ڕەوانە کرد. لەو کاتەدا باوکی عەلی حەسەن کوڕی بویە یا هەمان ڕۆکن ئەلدەولە فەرمانڕەوایەتی ئەوشارەی دەکرد. ئەم سوپایە ئەویان لەئیسفەهان دەرپەڕاند و دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت و بەناوی وەشمگیر وتاریان خوێندەوە. ڕۆکن ئەلدەولە لەئیسفەهانەوە ڕووی کردە فارس و لەدەرەوەی ئیستەخر ئوردووی لێدا. وەشمگیر هێرشی کردە سەر قەڵای ئەلەموت و خستیە ژێر فەرمانی خۆی و گەڕایەوە. گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئەو لەساڵی ٣٢٨/٩٤٠ زایینی درێژە پێدەدەین.

## شۆڕشی ئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا ئومەییە کوڕی ئیسحاق لەشاری شەنتەرین دژی عەبدولرەحمانی ئومەوی، فەرمانرەوای ئاندۆلۆس شۆڕشی کرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو ئەو، برایەکی بوو بەناوی ئەحمەد کەوەزیری عەبدولرەحمان بوو و بەدەستی عەبدولرەحمان کوژرا. لەم کاتەدا ئومەییە لەشەنتەرین بوو و کاتێك لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، لەهەمان شار ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و پەنای بۆ ڕەدمیر، پاشای جەلیقیان (تیرەیەك لەخەڵکانی ئیسپانیا) برد و ئەوی لەخاڵە لاوازەکانی موسوڵمانان ئاگادار کردەوە. ڕۆژێك ئومەییە بەمەبەستی ڕاو ڕۆشتە نێچیرگە و خەڵکانی شارە دەروازەکەیان بەسەردا بەست و ڕێگەیان نەدا بگەڕێتەوە بۆ ناو شارەکە. ئەوی ڕووی کردە ڕۆدمیر و ڕۆدمیر، ئەوی وەك وەزیری خۆی هەڵبژارد.

عەبدولرەحمان هێرشی کردە سەر سەرزەمینی جەلیقییەکان و لەم ساڵەدا ڕووبەڕووی ڕۆدمیر بوویەوە و جەلیقییەکان شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و عەبدولرەحمان ئەوانی ناکاوگیر کرد. دواتر جەلیقییەکان هاتنەدەر و بەسەر عەبدولرەحمان و سوپاکەی زاڵبوون و ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانانیان

کوشت. رۆدمیر بڕیاریدا شوێن هەڵاتوانی ئەوان بکەوێت بەڵام ئومەییە رێگەی ئەم کارەی لێگرت و ئەوی لەموسوڵمانەکان ترساند و بۆ گرتن و تاڵان کردنی گەنجینەکان هانیدا.

عەبدولرەحمان دوای جەنگ گەڕایەوە و بۆ جەنگی دووبارە لەگەڵ جەلیقییەکان سوپای ئامادە کرد. سوپاکەی ئەو بۆ وەرگرتنی تالانییەکان پێداگرییان کرد و چەند بەرابەری کوژراوی موسوڵمانان، لەوانیان کوشت. دواتر ئومەییە داوای ئەمانی لە عەبدولرەحمان کرد و پێی بەخشرا.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەسەفەر/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، مانگ بەتەواوی گیرا.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی باوکی حاتەمی رازی، نووسەری کتێبی جرح و تعدیل و عوسمان کوڕی خەتاب کوڕی عەبدوللە باوکی دنیا ناسراو بەئەشەج هەردووکیان مردن. دەوترا باوکی دنیا، چاوی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب کەوتبوو (لەبەر ئەمە بەباوکی دنیا ناویان دەبرد چوونکە بەم پێیە ساڵەکانی تەمەنی لەسێسەد تێپەڕی دەکرد). لەکۆتاییەکانی ژیانی ئەویان بەباوکی حەسەن ناو برد. کتێبێکی لێ بەجێماوە کەزۆربەی حەدیس بێژەکان لەگەڵ لاوازی ئەم کتێبە حەدیسی لێ دەگێڕنەوە.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی سەهل ئەبوبەکری خرائیتی نووسەری کتێبە ناودارەکانی وەك اعتلال القلوب و چەند کتێبێکی دیکە، لەشاری یافا کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەكانی ساڵی سێسەد و بیست و هەشتی كۆچی ( ٩٣٩و٩٤٠ زایینی )

### زاڵبوونی باوكی عەلی لەجورجان

لەموحەرەم/ ئۆكتۆبەری ئەم ساڵە باوكی عەلی كوڕی موحتاج لەگەڵ سوپای خوراسان لەنەیشابورەوە بەرەو جورجان بەڕێكەوت. لەم كاتەدا ماكان كوڕی كالی فەرمانڕەوایەتی جورجانی دەكرد. ئەو دژی ئەمیر نەسر كوڕی ئەحمەد شۆڕشی كردبوو. باوكی عەلی هەستی كرد ئەوان لەڕێگەی جورجان ئاویان بەرداوەتەوە، لەبەر ئەمە بێ ئەوەی ماكان و سوپاكەی ئاگادار ببنەوە، لەو ڕێگەیە گەڕایەوە و لەیەك فەرسەنگی جورجان ئوردووی لێدا و ماكانی ناكاوگیر و بارودۆخی لێ دژوار كرد و ڕێگەی نەدا خواردەمەنی بەجورجان بگات. ژمارەیەكی زۆر لەهاوەڵانی ماكان داوای ئەمانیان كرد و هەركەس لەجورجان مایەوە، ڕوبەڕووی دژواری بوویەوە تا ئەو جێگەی بژێوی پیاوێك مشتی كونجی و كەمێك سەوزی بوو.

ماكان داوای هاوكاری لەوەشمگیر لەڕەی كرد. وەشمگیر یەكێك لەسەركردەكانی خۆی بەناوی شیرح كوڕی نوعمان بۆ هاوكاری ئەو نارد. ئەو كاتێك گەیشتە جورجان و ئەو بارودۆخەی بینی، هەوڵیدا ئاشتی لەنێوان باوكی عەلی و ماكان كوڕی كالی سەقامگیر بكات تا لەم ڕێگەوە ماكان ڕزگار بكات. باوكی عەلی ڕازی بوو و ماكان بۆ تەبەرستان هەڵات و باوكی عەلی دەستی بەسەر جورجاندا گرت. ئەم پێشهاتە لەكۆتاییەكانی ساڵی ٣٢٨/٩٤٠ زایینی ڕوویدا. ئەو دوای ئەوەی بارودۆخی جورجانی ڕێكخست، ئیبراهیم كوڕی سیمجوری دەواتی وەك نوێنەری خۆی لەجورجان دانا. ئەو خۆی تا موحەرەمی ساڵی ٣٢٩/ ئۆكتۆبەری ٩٤٠ زایینی لەجورجان مایەوە و دواتر وەك ئاماژەی پێدەدرێت، ڕێگەی ڕەی گرتەبەر.

بەرێکەوتنی ڕۆکن ئەلدەولە بەرەو واست

لەم ساڵەدا ڕۆکن ئەلدەولە باوکی عەلی حەسەن کوڕی بویە ڕێگەی واستی گرتەبەر.

هۆکاری ڕۆشتنی ئەو بۆ ئەم شارە ئەوە بوو باوکی عەبدوللە بورەیدی سوپایەکی بۆ شوش نارد و سەرکردەیەکی دەیلەمی کوشت و باوکی جەعفەری سەیمەری لەشوش پەنای گرت. ئەو باجی ئەو دیارەی کۆدەکردەوە.

مۆعیزئەلدەولە باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی بویە کە لەئەهواز بوو، لەوە ترسا نەکا بورەیدی لەبەسرەوە هێرشی بکاتەسەر. لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ ڕۆکن ئەلدەولەی برای کە لەدەروازەی ئیستخر بوو – وەك ئاماژەمان پێدا لەئیسفەهان گەڕابوویەوە– نووسی. کاتێك ڕۆکن ئەلدەولە نامەی براکەی خوێندەوە، مەنزڵگەکانی یەك لەدوای یەك بڕی و بۆ پەیوەست بوون بەبراکەی ئەسپی غاردا و خۆی گەیاندە شوش. دواتر ڕێگەی واستی گرتەبەر بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرێت چوونکە لەئیسفەهان هاتبووەدەر و چیتر هیچ سەرزەمینێك نەبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ فەرمانڕەوایەتی تیا بکات. لەبەشی ڕۆژهەڵات دابەزی. سوپاکەی بورەیدی لەبەشی ڕۆژئاوا بوون. سوپاکەی کوڕی بویە پەرێشان و سەد کەسیان پەنایان بۆ بورەیدی برد.

دواتر خەلیفە رازی و بەجکەم بۆ جەنگی ئەو لەبەغدادەوە بەرەو واست بەرێکەوتن. کوڕی بویە لەوە ترسا ژمارەی دوژمن فراوان بێت و سوپاکەی داوای ئەمان لەبورەیدی بکەن و ئەو لەناو بچێت چوونکە نزیکەی یەك ساڵ دەبوو مانگانەی بەسوپاکەی نەدابوو. لەبەر ئەمە لەواستەوە بەرەو ئەهواز و لەوێوە بەرەو رامهورموز گەڕایەوەوە.

## زاڵبوونی ڕۆکن ئەلدەولە لەئیسفەهان

لەم ساڵەدا ڕۆکن ئەلدەولە بۆ ئیسفەهان گەڕایەوە و دەستی بەسەردا گرت. ئەو لەرامهورموز بۆ ئیسفەهان گەڕایەوە و سوپاکەی وەشمگیری لەو شارە دەرپەڕاند و ژمارەیەك لەوانی کوشت و زیاتر لەدە سەرکردەی ئەسیر کرد. چۆنیەتی ئەم شکستە بەم شێوەیە بوو وەشمگیر سوپاکەی خۆی بۆ هاوکاری ماکان– وەك ئاماژەی پێدرا– ڕەوانە کرد بوو و لەبەر ئەمە سوپاییەکانی ئەو لەئیسفەهان نەمابوونەوە. ڕۆکن ئەلدەولە کاتێك گەیشتە ئیسفەهان کەژمارەیەکی کەم لەسوپاییەکانی وەشمگیر لەو شارە دەبینرا. ئەو، ئەوانی تێکشکاند ودەستی بەسەر شارەکەدا گرت. ئەو و براکەی عیماد ئەلدەولە نامەیان بۆ باوکی عەلی کوڕی موحتاج نووسی و ئەویان دژی ماکان و وەشمگیر هاندا و بەڵێنی هاوکارییان پێدا. بەم شێوەیە دۆستایەتی لەنێوان ئەوان هاتە ئاراوە.

## ڕۆشتنی بەجکەم بۆ سەرزەمینی چیاکان و گەڕانەوەیان

لەم ساڵەدا بەجکەم لەبەغدادەوە بەرەو چیاکان (لوڕستان و کوردستان) بەرێکەوت و دواتر گەڕایەوە.

هۆکاری بەجکەم لەم کارە ئەوە بووە لەم ساڵەدا لەگەڵ باوکی عەبدوللەی بورەیدی پەیمانی ئاشتی بەست و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری ئەو. بورەیدی نوێنەرێکی بۆ لای ئەو نارد و پێشنیاری کرد بەرەو چیاکان بڕوات و دەست بەسەر ئەو سەرزەمینانەدا بگرێت. بورەیدی بیری بەجکەمی خستەوە کەئەگەر بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوێت، ئەویش هێرش دەکاتە سەر ئەهواز و لەدەستی کوڕی بویەی دەردێنێت. ئەم دووانە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی بەجکەم پێنسەد سەرباز لەسوپاکەی خۆی بۆ هاوکاری بورەیدی ڕەوانە بکات. بەجکەم، هاورێکەی خۆی، باوکی زەکەریایی شوشی بۆ لای بورەیدی نارد تا بۆ ڕۆشتن هانی بدات ولای

بورەیدی مایەوە تا لەواستەوە بەرەو ئەهواز ئەسپی غاردا.

بەجکەم روویکردە حولوان و باوکی زەکەریای شوشی، بورەیدی بۆ ڕۆشتن بەرەو شوش و ئەهواز هان دەدا بەلأم بورەیدی خۆی دوادەخست و دەیویست بەرەو بەغداد بڕوات چوونکە بەجکەم لەوێ دوور کەوتبوویەوە و بورەیدی دەیویست دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرێت بەلأم لەم مەبەستەی دوو دڵ بوو و چاوەڕوانی دەکرد بۆ ئەوەی بەجکەم تێکبشکێت یا بکوژرێت. باوکی زەکەریا یەك مانگ لای بورەیدی مایەوە و ئەوی بۆ هێرش کردنە سەر ئەهواز هان دەدا بەلأم بورەیدی بەردەوام بیانوی دەهێنایەوە. باوکی زەکەریا لەمەبەستەکەی ئەو ئاگادار بوویەوە و نامەیەکی بۆ بەجکەم نووسی و ئاگاداری کردەوە. بەجکەم لەرێگەدا نامەکەی پێگەیشت. لەبەر ئەمە سوار وشترێکی تیژپێ بوو و بەرەو بەغداد گەڕایەوە و سوپاکەی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشت.

بورەیدی ئاگادار بوویەوە کەبەجکەم گەڕاوەتەوە بۆ بەغداد. پەشیمان بوویەوە و دواتر هەواڵی پێگەیشت کەبەجکەم دەیەوێت هێرشی بکاتەسەر.

## سەرکەوتنی بەجکەم لەواست

کاتێك بەجکەم بۆ بەغداد گەڕایەوە، خۆی بۆ ڕۆشتن بۆ واست ئامادە کرد و رێگەکانی خستە ژێر چاودێرییەوە بۆ ئەوەی هەواڵی ئەم کارە بەباوکی عەبدوللە بورەیدی نەگات. بەجکەم لەبیستی زیقەعدە/ بیست و هەشتی ئۆگۆست خۆی سوار لەسەر کەشتی بەرێکەوت و سوپاکەی لەرێگەی وشکانییەوە ڕەوانە کرد و ناوی بورەیدی لەوەزارەت سڕییەوە و باوکی قاسم سلێمان کوڕی حەسەن کوڕی مەخلەدی وەك وەزیر هەڵبژارد. وەزارەتی بورەیدی یەك ساڵ و چوارمانگ و چواردە رۆژ درێژەی کێشا. بەجکەم، عەلی کوڕی شێرزادی گرت چوونکە ئەو پەیوەندی لەنێوان ئەو دووانە دروست کرد. بەجکەم، سەد و پەنجا هەزار دیناری لەشێرزاد وەرگرت.

سەرسورهێنەر ئەوەی بەجکەم دەبیرێکی بوو کەکاروباری کۆشك و کەسانی دەوروبەری رادەپەڕاند. کاتی ڕۆشتنی ئەو بۆ واست ئەم دەبیرە لەگەڵ بەجکەم

لەناو کەشتییەکەدا دەبینرا. لەناکاو کۆترێك هات و لەسەر کەشتییەکەی نیشتەوە. ئەویان گرت و بردیانە لای بەجکەم. ئەو نامەیەکی بەکلکی کۆترەکەوە بینی و نامەکەی کردەوە. ئەم دەبیرە نامەکەی بۆ براکەی لەواست نووسیبوو و لەهاتنی بەجکەم ئاگاداری کردبوونەوە. نامەکەیان نیشان خۆیدا وئەو حاشای لەراستی نەکرد. ئەویان کوشت و فڕیاندایە ناو ئاوەکە.

کاتێك بورەیدی لەهێرشەکەی بەجکەم ئاگادار بوویەوە، چیتر لەواست نەمایەوە و بەرەو بەسرە هەڵات. کاتێك بەجکەم گەیشتە واست، کەسی لەوێ نەبینی و بێ جەنگ دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. بەجکەم سوپایەکی لەچیاکان بەجێهێشتبوو. دەیلەمی و گیلانییەکان هێرشیان کردە سەر ئەم سوپایە و بەهەڵاتن ناچاریان کردن و سوپاییەکان بۆ بەغداد گەڕانەوە.

## زاڵبوونی کوڕی رائیق لەشام

لەم ساڵەدا کوڕی رائیق دەستی بەسەر شامدا گرت. پێشتر ئاماژەمان بەڕۆشتنی ئەودا. کاتێك ڕۆشتە شام، مەبەستی حیمسی کرد و دەستی بەسەردا گرت و لەوێوە ڕێگەی دیمەشقی گرتەبەر. دیشمەق لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی بەدر کوڕی عەبدوللەی ئەخشیدی ناسراو بەبودەیر بوو. ئەو فەرمانڕەوای ئەخشید لەدیمەشق بوو. کوڕی رائیق ئەوی دەربەڕاند و دەسەڵاتی بەسەر شارەکە بڵاو کردەوە و لەوێوە ڕێگەی رەملەی گرتەبەر و دەستی بەسەر ئەو شارەیشدا گرت.

دواتر بەرەو عەریشی میسر ئەسپی تاودا و مەبەستی گرتنی میسری کرد. ئەخشید کوڕی محەممەد کوڕی توغج رووبەرووی بوویەوە و جەنگ دەستپێکرد بەڵام ئەخشید هەڵات و سوپاکەی کوڕی رائیق بەکۆکردنەوەی تاڵانی سەرقاڵ بوون و ڕۆشتنە ناو خێوەت و بارەگاکانی سوپاکەی ئەخشید. لەم کاتەدا ئەو کەسانەی لەسوپاکەی ئەخشید بۆسەیان نابوویەوە، هاتنەدەر و رووبەروویان بوونەوە و بەهەڵاتن ناچاریان کردن. کوڕی رائیق لەگەڵ حەفتا پیاو لەمەرگ رزگاری بوو و بەریسواترین شێوە خۆی گەیاندە دیمەشق.

ئەخشید، براکەی باوکی نەسر کوڕی توغجی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەدوای

ئەودا ڕەوانە کرد. کاتێك کوڕی رائیق لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، بڕیاری ڕووبەڕوو بوونەوەی دا و بەخێرایی لەدیمەشقەوە بۆ جەنگی ئەم سوپایە ئەسپی غاردا. هەردوو سوپا لەچواری زیحەججە/ یانزەی سێپتامبەر لەلەجون ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سوپای باوکی نەسر شکستی خوارد و خۆی کوژرا. کوڕی رائیق جەنازەی ئەوی هەڵگرت، کفنی کرد و لەگەڵ کوڕەکەی موزاحیم کوڕی محەممەد کوڕی رائیق بۆ لای براکەی لەمیسر، گەڕاندییەوە و نامەیەکی بۆ ئەخشید نووسی و پرسەی خۆی بۆ مەرگی براکەی پێ ڕاگەیاند و لەوەی ڕوویدابوو، داوای بەخشینی کرد و سوێندی خوارد مەبەستی کوشتنی ئەوی نەبووە و کوڕەکەی ناردووە تا ئەگەر دەخوازێت لەجیاتی براکەی بیکوژێت. ئەخشید ڕێزی لەکوڕەکەی گرت و خەڵاتی پێبەخشی و ئەوی بۆ لای باوکی گەڕاندەوە و لەسەر ئەو بنەمایە ڕێککەوتن کەرەملە و ئەولای ڕەملە لەژێر فەرمانی ئەخشید بێت و سەرزەمینەکانی دیکەی شام لەژێر فەرمانی کوڕی رائیق و ئەخشید ساڵانە سەد و چل هەزار دینار لەرەملەوە بۆ کوڕی رائیق بنێرێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا تەریفی سوبکەری کوژرا.

لەم ساڵەدا بەجکەم، وەزیرەکەی خۆی باوکی جەعفەر کوڕی شێرزادی – لەبەر ئەو هۆکارەی ئاماژەمان پێدا– لەسەر کار لابرد و سەد و پەنجا هەزار دیناری لێسەند و دوای ئەو باوکی عەبدوللەی کوفی وەك وەزیر دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یەعقوب مرد و محەممەد کوڕی عەلی باوکی جەعفەری کولەینی کە لەپێشەواکان و شارەزایانی ئایینی شیعەی ئیمامییە (دوانزە ئیمامی) بوو، مرد.

لەم ساڵەدا لەمانگی سەفەر/ سێپتامبەر، باوکی حەسەن محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەییووبی قورئان خوێنی بەغدادی، ناسراو بەکوڕی شەنبوز مرد.

لەم ساڵەدا باوکی محەممەد جەعفەری مورتەعیش، لەگەورەکانی سۆفیە، مرد. ئەو لەنەیشابور چاوی بەدنیا هەڵهێنا بەڵام دانیشتوی بەغداد بوو.

لەم ساڵەدا قازی قازییەکان عومەر کوڕی باوکی عومەر محەممەد کوڕی یوسف کەدوای باوکی وەك قازی دەستنیشان کرا، مرد.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی قاسم کوڕی محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی بەشار ناسراو بەکوڕی ئەنباری، نووسەری کتێبی الوقف و الابتدا، چاوی لێکنا.

لەیانزەی شەوال/ بیست و یەکی جولای ئەم ساڵە باوکی عەلی کوڕی موقلەی وەزیر لەزیندان مرد.

لەبیست و هەشتی شەوال/ یانزەی ئۆگۆستی ئەم ساڵە باوکی عەباسی خوسەیبی وەزیر بەهۆی جەڵتەوە مرد. ئەو حەقدە رۆژ دوای کوڕی موقلە مرد.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوڵڵەی قومی، وەزیری رۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە، مرد و رۆکن ئەلدەولە، باوکی فەزڵ کوڕی عەمیدی وەك وەزیر هەڵبژارد و ئەو پێگەیەکی لای کوڕی بویە بەدەست هێنا کەهیچ وەزیرێك ئەو پێگەی پێ نەبرا. باسی بەسەرهات و رووداوەکانی تایبەت بەو دەکەین تا پێگەکەی باشتر بناسین.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و بیست و نۆی کۆچی ( ٩٤١ زایینی )

### مەرگی خەلیفە ڕازی

لەم ساڵەدا خەلیفە ڕازی باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی موقتەدر لەنیوەی ڕەبیع الاوەل/ نۆزدەی دێسامبەر مرد. خەلافەتی ئەو شەش ساڵ و دە مانگ و دە ڕۆژی خایاند و ساڵەکانی ژیانی سی و دوو ساڵ و چەند مانگ درێژەی کێشا. ئەو گرفتاری نەخۆشی تینویەتی ببوو. شاعیرێکی وتاردەر بوو. ئەمە یەکێك لەهۆنراوەکانی ئەوە:

يصفر وجهى اذا تأمله    طرفى و يحمر وجهه خجلا

حتى كان الذى بوجنته    من دم جسمى اليه قد نقلا

واتاکەی: کاتێك چاوەکانی من سەیری دەکات، ڕووی من زەرد دەبێت و ڕوخساری ئەو لەشەرما سوور دەبێت. دەڵێی ئەوەی لەڕوخساری ئەودایە، لەخوێنی جەستەم بۆ ئەو گوازراوەتەوە.

ئەو لەپرسەی باوکی ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

و لو ان حيا كان قبرا لميت    لصيرت احشائى لا عظمه قبرا

و لون ان عمرى طوع مشيئتى    و ساعدنى التقدير قاسمته العمرا

بنفسى ثرى ضاجعت فى تربه البلى    لقد ضم منك الغيث و الليث و البدرا

واتاکەی: ئەگەر زیندوویێك بتوانێت بۆ مردوویێك ببێتە گۆڕ، من ناخی خۆم بۆ ئێسقانەکانی دەکردە گۆڕ، ئەگەر ژیانی من شوێنکەوتەی خواستەکانم دەبوو و ڕۆژگاریش هاوکاری دەکردم، ژیانی خۆم لەگەڵ ئەو دابەش دەکرد. گیانم بەقوربانی ئەو خاکە بێت کەتۆ دەرزێنێت و تۆ لەناو ئەودا ئارامت گرتووە، خاکێك کە لەگەڵ تۆ باران و شێر و مانگی لەبەردا گرتووە.

هەروەها لەهۆنراوەکانی ئەوە:

كل صفو الى كدر    كل امن الى حذر

و مصير الشباب للـ    ـموت فيه او الكدر

در در المشيب من | واعظ ينذر البشر
ايها الامل الذى | تاه فى لجة الغرر
اين من كان قبلنا | درس العين و الاثر
سيرد المعاد من | عمره كله خطر
رب انى ذخرت عنـ | ـدك ارجوك مدخر
اننى مؤمن بما بيـ | ـن الوحى فى السور
و اعترافى بترك نفـ | ـعى و ايثارى الضرر
رب، فاغفر لى الخطيـ | ـئة يا خير من غفر

واتاكەی: هەر ژیانێكی خۆش بەتاڵی و هەر ئاسوودەییەك بەنیگەرانی كۆتایی دێت. كۆتایی گەنجی یا مەرگە یا پیری. خۆش بەحاڵی ئەو بەتەمەنی ئامۆژگاری دەدات و مرۆڤ بەئاگا دێنێتەوە. ئەی ئارەزوومەندی هیوادار كە لەدەریایی سەرمەستی ون بوویت، ئەوانەی پێش ئێمە بوون، چییان بەسەر هات، خۆیان و نیشانەكانیان لەناو چوون. رۆژی مەترسیداری هەستانەوە، ئەم ژیانە دەگەڕێنێتەوە. ئەی خواوەنداً من لای تۆ پاشەكەوتم كرد و هیوای باشترین پاشەكەوتم لەتۆ هەیە. من بەوەی وەحی لەسوڕە قورئانییەكان ئاماژەی پێداوە، باوەڕدارم. من دانم بەوەدا ناوە كەسوودی خۆم پشتگوێ خستووە و زیانم هەڵبژاردووە. خواوەند! ئەی باشترینی بەخشندەكان، لەهەڵە و تاوانەكانی من خۆش ببە.

رازی بەخشندە و دەستبڵاو بوو و هاونشینی لەگەڵ ئەدیب و زاناكان و فرەزانەكانی بەخۆش دەزانی.

كاتێك رازی مرد، بەجكەم هاونشینەكانی ئەوی كۆكردەوە و ویستی سوودێكیان لێ بەدەست بێنێت بەڵام هیچی دەستنەكەوت. یەكێك لەوان سەنان كوڕی سابتی سابی پزیشك بوو. رۆژێك رازی ئەوی بانگ كرد و لەزاڵبوونی توڕەیی بەسەر خۆیدا سكاڵای بەرز كردەوە. سابی بەردەوام تووڕە بوونی ئەوی سەركۆنە و خۆڕاگری و بەخشین و دادپەروەری ئەوی وەسف دەكرد و لەگەڵ رازی مایەوە تا ئەوەی توانی بەسەر توڕەیی خۆیدا زاڵ ببێت و دەست لەكوشت و بڕین

هەڵگرێت.

رازی ئەسمەر، چاو گەورە و ڕیشی تەنك بوو. دایکی، دایکی منالٚ بوو بەناوی زەڵوم. ئەو لەچەند تایبەتمەندییدا دووایین خەلیفە هەژمار دەکرێت: ئەو دووایین خەلیفە بوو هۆنراوەکانی لەدیوانێکدا کۆکردۆتەوە، دوایین خەلیفە بوو لەسەر مینبەر بەزۆری وتاری دەخوێندەوە هەرچەند خەلیفەکانی دیکە وتاریان خوێندۆتەوە بەلاٚم کەم بایەخن. دووایین خەلیفە بوو لەگەڵ هاونشینەکان دادەنیشت و خزمەتکارەکان دەڕۆشتنە لای. دووایین خەلیفە بوو خەرجییەکانی دابین دەکرد و پاداش و بەخشش و جوامێری پیٚ بڕابوو و گەنجینە، چێشتخانە، نشینگە و خزمەتکار و پەردەداری بوو و کارەکانی خۆی هاوشێوەی خەلیفەکانی پێش خۆی رێکدەخست.

## خەلافەتی موتەقی باللە

کاتێك رازی مرد، کارەکانی خەلافەت لەچاوەڕوانی گەیشتنی باوکی عەبدوللەی کوفی دەبیری بەجکەم، کە لەگەڵ بەجکەم لەواست بوو، مایەوە. کۆشکی خەلافەت پارێزگاری لێدەکرا تا ئەوەی نامەی بەجکەم بەکوفیدا گەیشتە کۆشك. لەم نامەدا فەرمانی بەکوفی دابوو لەگەڵ باوکی قاسم سلێمان کوڕی حەسەن، وەزیری رازی و هەرکەس لەدەرگای ئەو پێگەی وەزارەتی پێبڕاوە و هەروەها لەگەڵ سەرپەرەستی دیوانەکان و عەلەوییەکان و قازییەکان و عەباسییەکانی شار چاوپێکەوتن ئەنجام بدات و هەرکەسێك کەکوفی دین و ئایینەکەی پەسەند بکات، بۆ خەلافەتی ئەو راوێژ بکەن. کوفی هەموویانی کۆکردەوە و راوێژی پێکردن. دەستەیەك ناوی ئیبراهیم کوڕی موقتەدریان برد. ئەم کۆبوونەوەیە ئەو رۆژە بلاٚوەی پێکرا و بۆ بەیانی، هەمووان لەسەر خەلافەتی ئیبراهیم رێککەوتن. ئەو هاتە کۆشکی خەلیفە و لەبیستی رەبیع الاوەل/ بیست و سیٚی ژانویە بەیعەتیان لەگەڵ بەست و چەند نازناوێکیان پێشنیار کرد و ئەو موتەقی باللە ی هەڵبژارد و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد. لەلایەن خەلیفەی تازە هەڵبژێردراو خەلاٚت و ئالاٚی فەرمانڕەوای بۆ بەجکەم لەواست ڕەوانە کرا.

دوای مەرگی رازی و پێش هاتنە سەرکاری موتەقی، بەجکەم کەسانێکی بۆ کۆشکی خەلافەت نارد و فەرش و شتە گرانباییەکانی هەڵگرت. موتەقی سەلامەی تولونی وەك پەردەداری خۆی هەڵبژارد و سلێمانی کردە وەزیر بەڵام سلێمان تەنیا بەناو وەزیر بوو و هەموو کاروبارەکان لەلایەن کوفی، دەبیرەکەی بەجکەم ئەنجام دەدران.

## کوژرانی ماکان کوڕی کالی و زاڵبوونی باوکی عەلی کوڕی موحتاج لەڕەی

پێشتر ئاماژەمان بەڕۆشتنی باوکی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی موزەفەر بەجورجان و دەرپەڕاندنی ماکان کوڕی کالیدا. ماکان لەجورجانەوە بەرەو تەبەرستان بەرێکەوت و لەوێ مایەوە. باوکی عەلی لەجورجان مایەوە و کاروبارەکانی ئەو دیارەی رێکخست و دواتر ئیبراهیم کوڕی سیمجوری دەواتی وەك نوێنەری خۆی بەجێهێشت و لەموحەرەم/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە رێگەی ڕەی گرتەبەر و لەرەبیع الاوەل/ دێسامبەر گەیشتە ئەو شارە. ڕەی لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی وەشمگیر کوڕی زیار، برای مەرداویج، بوو.

عیماد ئەلدەولە و رۆکن ئەلدەولە دوو کوڕەکەی بویە، نامەیان بۆ باوکی عەلی نارد و بۆ هێرش کردنە سەر وەشمگیر هانیاندا و بەڵێنی هاوکارییان پێدا. ئەم دووانە دەیانویست باوکی عەلی دەست بەسەر شاری ڕەی بگرێت و ئەو کاتەی دەستی بەسەردا گرت لەبەر بەرفراوانی خوراسان ناتوانێت لەوێ بمێنێتەوە و ئەم دووانە دەتوانن دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرن.

وەشمگیر لەهاودەستی ئەوان ئاگادار بوویەوە و نامەیەکی بۆ ماکان کوڕی کالی نووسی و ئەوی ئاگادار کردەوە و داوای هاوکاری لێکرد. ماکان لەتەبەرستانەوە ئەسپی بەرەو ڕەی غاردا. باوکی عەلی بەرێکەوت و سوپاکەی رۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە پەیوەستی بوو و هەمووان لەئیسحاق ئاباد کۆبوونەوە و رووبەرووی سوپاکەی وەشمگیر بوونەوە. ماکان لەناوەڕاستی سوپاکەیدا مایەوە و جەنگی دەستپێکرد. باوکی عەلی سوپاکەی کردە چەندین دەستە و فەرمانی بەدەستەکانی ناوەڕاستدا لەسەر جەنگ پێداگر و خۆڕاگر بن و دواتر پاشەکشێ بکەن و دوژمن

ناچار بکەن شوێنیان کەوێت، فەرمانی بەباڵی ڕاست و چەپی سوپاکەیدا بەرادەیەك سەرقاڵیان بکەن کەنەتوانن هاوکاری دڵی سوپاکەیان بکەن. فەرمانەکانی ئەنجام دران.

سوپاکەی باوکی عەلی لەجەنگ لەگەڵ دڵی سوپای وەشمگیر پێداگرییان کرد و دواتر کەم کەم پاشەکشێیان کرد بەم شێوەیە ماکان و هاوڕێکانی چاوی تەماحیان تێبڕین و شوێنیان کەوتن و جێگەکانی خۆیان بەجێهێشت. لەم کاتەدا باوکی عەلی فەرمانی بەچەند دەستەیەکی جێگیر لەباڵی چەپدا لەپشتەوە هێرش بکەنە سەر دڵی سوپاکەی وەشمگیر. ئەو کارەیان کرد. کاتێك باوکی عەلی بینی سوپاکەی لەپشتەوە هێرش دەکاتە سەرماکان، فەرمانی گەڕانەوەی بەو دەستەیەدا کەپاشەکشێیان کردبوو. ئەوانیش هێرشیان کردە سەر ماکان و سوپاکەی. سوپاکەی باوکی عەلی کاتێك بینییان هاوڕێکانیان لەپشتەوە هێرشیان کردۆتە سەر سوپاکەی ماکان، ورەیان بەرز بوویەوە و گەڕانەوە و سوپاکەی ماکانیان شمشێرباران کرد. سوپاکەی ماکان هەڵاتنیان بەباشترین ڕێگەچارە بینی.

کاتێك ماکان ئەم دۆخەی بینی، لەئەسپەکەی دابەزی و جەنگێکی بوێرانەی لەخۆی نیشاندا و لەناکاو تیرێك بەشێوەیەکی سەیر لەناوچاوی چەقی و لەخودە و سەری گوزەری کرد و لەپشتەوە هاتەدەر. ماکان بەمردووی کەوتە سەرزەوی و وەشمگیر و پاشماوەی سوپاییەکان بەرەو تەبەرستان هەڵاتن و لەوێ مانەوە. باوکی عەلی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و سەری ماکانی بۆ بوخارا نارد. سەری ماکانیان تا کوژرانی بەجکەم بۆ بەغداد نەنارد چوونکە بەجکەم ماکانی خۆش دەویست و لەکاتی کوژرانی ماکان پرسەی بۆ گێڕا. کاتێك بەجکەم کوژرا، سەری ماکانیان بەهەمان تیر و خودە بۆ بەغداد ڕەوانە کرد. باوکی عەلی ئەسیرەکانی بۆ بوخارا نارد و لەوێ مانەوە تا ئەو کاتەی وەشمگیر ملکەچی بۆ فەرمانەکانی بنەماڵەی سامان دەربڕی و بەرەو خوراسان بەڕێکەوت و داوای بەخشینی ئەسیرەکانی کرد و وەك لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٣٣٢/٩٤٤ زایینی ئاماژەی پێدەدەین، ئەسیرەکان ئازاد کران.

## کوژرانی بەجکەم

چۆنیەتی کوژرانی ئەو بەم شێوە بوو: باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی سوپایەکی لەبەسرەوە بەرەو مەزار ڕەوانە کرد. بەجکەمیش سوپایەکی بەفەرماندەیی تەوزون بۆ جەنگی ئەوان نارد. شەڕێکی قورس ڕوویدا و سوپای تەوزون شکستی خوارد. ئەو نامەیەکی بۆ بەجکەم نووسی و داوای هاوکاری کرد. بەجکەم لەواستەوە بۆ هاوکاری کردنی ئەوان بەرێکەوت. ئەم پێشهاتە لەنیوەی ڕەجەب/ شانزەی ئاوریل روویدا. لەم کاتەدا بەجکەم نامەیەکی تەوزونی بەدەست گەیشت کەهەواڵی سەرکەوتنی لەجەنگی دووەم پێ دەدا و نووسیبووی سوپای بورەیدی تێکشکاندووە. بەجکەم مەبەستی گەڕانەوە بۆ واستی کرد. دەستەیەك لەهاوەڵانی داوایان لێکرد بڕواتە گۆڕەپانی جەنگ. بەجکەم ڕازی بوو و بەدوای سوپا تێکشکاوەکەی بورەیدی تا ڕووباری جور پێشڕەوی کرد. بیستی ژمارەیەك لەکوردە دەوڵەمەندەکان لەوێ ژیان بەسەر دەبەن. تەماحی دەست درێژی کردنە سەر ئەم سامانەی لا دروست بوو و لەگەڵ چەند کەس لەهاوەڵانی خۆی، بێ کەرەستەی جەنگ مەبەستی ئەوانی کرد. کوردەکان هەڵاتن. بەجکەم یەکێك لەهەڵاتووانی کردە نیشانە بەڵام تیرەکەی بەر نیشانەکە نەکەوت. نەیتوانی کەسی دووەمیش بکاتە نیشانە لەکاتێکدا پێشتر تیرەکانی بەهەڵەدا نەدەچوون. لەناکاو گەنجێکی کورد لەدواوە خۆی پێگەیاند و بێ ئەوەی بزانێت کێیە، کەلەکەی بریندار کرد و ئەم برینە لەبیست و شەشی ڕەجەب/ بیست و حەوتی ئاوریل گیانی ئەوی گرت. (ئەمەیە سزای ئەو کەسەی بێ هۆ دەستدرێژی دەکاتە سەر گیان و سامانی کەسانی دیکە.) دوای مەرگی ئەو ناسازگاری لەناو سوپاکەی سەریهەڵدا و سەربازە دەیلەمییەکان کەژمارەیان دەگەیشتە هەزار و پێنسەد کەس، پەیوەستی بورەیدی بوون. بورەیدی ڕێزی گرتن و ڕۆژانەی ئەوانی بۆ دوو بەرابەر زیاد کرد و بەیەکجێ پێی دان.

بورەیدی دەیویست لەگەڵ براکانی بەرەو بەسرە هەڵبێت. بەجکەم نامەیەکی بۆ خەڵکانی بەسرە نووسیبوو و دڵی ئەوانی لەبورەیدی پاك کردبوویەوە و بۆیە

جارێکی دیکە خەڵکانی بەسرە خوازیاری پەیوەست بوون بەبورەیدی بوون. بەم شێوەیە هاوەڵانی بورەیدی لەکاتێکدا گومانیان نەدەکرد، دەوڵەمەند و بەهێز بوون. هاوەڵە تورکەکانی بەجکەم بۆ واست گەڕانەوە. تەکنیك کە بەفەرمانی بەجکەم لەواست زیندانی کرابوو، بەدەستی تورکەکان لەزیندان ئازاد کرا و ئەو، ئەوانی بۆ بەغداد برد و هەموویان ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی موتەقی باللە نیشاندا.

باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی مەیمون، جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست و موتەقی دەستی بەسەر کۆشك و سامانەکانی بەجکەمدا گرت. بەجکەم لەم کۆشکەدا سامانێکی زۆری شاردبوویەوە بەهەمان شێوە لەدەشتیش ئەو کارەی کردبوو چوونکە لەوە دەترسا ڕۆژێك گرفتاری کارەساتێکی ناخۆش ببێت و نەتوانێت لەکاتی پێویست خۆی بگەیێنێتە کۆشکەکەی. بڕی ئەم سامانە دەگەیشتە هەزار هەزار و دووسەد هەزار دینار. بەجکەم دوو ساڵ و هەشت مانگ و نۆ ڕۆژ، فەرمانڕەوایەتی کرد.

## بەرێکەوتنی هاوەڵانی بورەیدی بەرەو بەغداد

کاتێك بەجکەم کوژرا، دەیلەمییەکان بۆ پەیوەست بوون بەبلسواز (بلسوار) کوڕی مالکە کوڕی موسافر بەرێکەوتن بەڵام تورکەکان ئەویان کوشت و بەمشێوەیە دەیلەمییەکان پەیوەستی باوکی عەبدوللە بورەیدی بوون. ئەوان نەتەوەیەکی هەڵبژێردراو و پاك بوون. بورەیدی بەپەیوەست بوونی ئەوان هێز و پێگەی زیادی کرد و هەموویان لەمانگی شەعبان لەبەسرەوە بەرەو واست بەرێکەوتن. موتەقی پەیامی بۆ ناردن تا کۆتایی بەم ڕێگەیە نەهێنن. ئەوان لەوەڵامدا وتیان: ئێمە پێویستمان بەپارەیە، ئەگەر بەشێك لەسامانەکانی بەجکەم بەئێمە بدرێت، دەگەڕێینەوە. موتەقی سەد و پەنجا هەزار دیناری بۆ ئەوان نارد. تورکەکان بەموتەقییان وت: ئێمە لەگەڵ سوپاکەی بورەیدی دەجەنگین، پارەمان بخە بەردەست و فەرمانددەیەکمان بۆ هەڵبژێرە. موتەقی چوارسەد هەزار دیناری بەوان و سەربازە کۆنەکانی بەغداد بەخشی و سەلامەی تولونی وەك فەرماندەی ئەوان

هەڵبژارد و هەموان هاوڕێ لەگەڵ موتەقی باڵلە لەرۆژی هەینی، بیست و دووی شەعبان/ بیست و سێی مەی گەیشتنە رووباری دیالە.

بورەیدی لەرێگەی واستەوە بەرەو بەغداد بەرێکەوت و بەڵێن و پەیمانەکەی خۆی نەبردەسەر. کاتێك لەبەغداد نزیك بوویەوە، لەنێوان سوپا تورکەکەی بەجکەم ناسازگاری هاتە ئاراوە و دەستەیەك داوای ئەمانیان لەبورەیدی کرد و بەشێکیان رێگەی موسڵیان گرتەبەر و سەلامەی تولونی و عەبدوڵلەی کوفی خۆیان شاردەوە. خەلیفە هیچ رێگە چارەیەکی نەبینی مەگەر ئەوەی لەدەوڵەمەند و بەتواناکان باج وەربگرێت بۆ ئەوەی لەترسی ستەمکاری و بوێری ئەو، بەغداد بەجێبێڵێت.

باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی لەدوانزەی رەمەزان/ دوانزەی جون هاتە ناو بەغداد و لەماڵی شەفیعی نیشتەجێ بوو. باوکی حسەینی وەزیر و قازی و دەبیرەکان سەردانیان کرد. کەشتییەکانی ئەو لەژماردن نەدەهات. موتەقی پەیامی بۆ نارد و پیرۆزبایی تەندروستی لێکرد و چەندین شەوی بەردەوام خواردنی بۆ نارد و ئەوی وەك وەزیر بانگ دەکرد بەهەمان شێوە کەباوکی حسەین کوڕی مەیمون وەزیر خەلیفەیش بەوەزیر بانگ دەکرا، بەلام باوکی حسەین لەسەر کار لابرا. ئەو سی و سێ رۆژ وەزیر بوو. دواتر باوکی عەبدوڵلەی بورەیدی، باوکی حسەینی گرت و ڕەوانەی بەسرەی کرد و لەزیندان هێشتییەوە تا ئەو کاتەی مرد. ئەم پێشهاتە لەمانگی سەفەری ٩٤١/٣٣٠ زایینی روویدا. باوکی حسەین گرفتاری (تا)یەکی کوشندە بوو و ئەمە بووە هۆی مردنی.

لەم کاتەدا بورەیدی نوێنەرێکی بۆ لای موتەقی نارد و داوای پێنسەد هەزار دیناری لێکرد تا لەناو سوپاکەی دابەشی بکات. موتەقی ئەم پارەی نەنارد. بورەیدی نوێنەرێکی نارد و ئاگاداری کردەوە و بەسەرهاتەکەی موعتەز، موستەعین و موهتەدی بیر هێنایەوە. نوێنەرەکان لەنێوان ئەو دووانە هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی موتەقی پێنسەد هەزار دینارەکەی بۆ نارد و بورەیدی تا ئەو کاتەی لەبەغداد بوو، چاوی بەموتەقی نەکەوت.

## گەڕانەوەی بورەیدی بۆ واست

بورەیدی فەرمانی بەسوپاکەیدا داوای مانگانە لەخەلیفە بکەن و کاتێك خەلیفە پێنسەد هەزار دینارەکەی بۆ نارد، سوپاییەکان چاوی تەماحیان لەخەلیفە هەڵگرت و بڕییانە بورەیدی و فێڵەکەی داوێنی خۆی گرتەوە و سوپا دژی ئەو شۆڕشی کرد. دەیلەمییەکان، کورتەکینی دەیلەمی و تورکەکان، تکنیکی تورك، کۆیلەی بەجکەمیان وەك فەرماندەی خۆیان هەڵبژارد. دەیلەمییەکان هێرشیان کردە سەر ماڵی بورەیدی و ماڵی براکەی باوکی حسەینیان سووتاند. ئەوان لەبورەیدی جیابوونەوە و تەکنیك پەیوەستیان بوو. هەموویان پەیمانیان بەست و بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر بورەیدی بۆ ئەوەی دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرن. ئەوان بەرەو نەجمی بەرێکەوتن و خەڵکی شاریش پەیوەستیان بوون. بورەیدی پردەکەی پچڕاند و شەڕ بۆ ناو ئاو گوێزرایەوە و خەڵکی کۆڵان و گەڕەك لەبەشی رۆژئاوا دژی هاوەڵانی بورەیدی شۆڕشیان کرد و بورەیدی لەگەڵ براکەی و کوڕەکەی، باوکی قاسم، و هاورێکانی لەرێگەی رووبارەوە بۆ واست هەڵاتن. ماڵەکەی ئەو لەنەجمی تاڵان کرا بەهەمان شێوە ماڵی سەرکردەکانیشی. ئەم پێشهاتە لەکۆتایی رەمەزان/ بیست و نۆی جون روویدا.

بورەیدی بیست و چوار رۆژ لەبەغداد بوو.

## فەرمانڕەوای کورتکینی دەیلەمی

کاتێك بورەیدی هەڵات، کورتکین، جڵەوی کاروبارەکانی بەغدادی گرتەدەست و ڕۆشتە ناو کۆشکی موتەقی. موتەقی ئەوی کردە ئەمیری ئەمیرەکانی بەغداد و خەڵاتی پێ بەخشی. موتەقی، عەلی کوڕی عیسا و براکەی عەبدولرەحمان کوڕی عیسای بانگ کرد و فەرمانی بە عەبدولرەحماندا بێ ئەوەی وەزیر بێت، کاروباری وەزارەت بەرێوە ببات. کورتکین لەپێنجی شەوال/ پێنجی جولای، تەکنیکی تورکی گرت و ئەوی لەرووباردا خنکاند و راپەڕاندنی هەموو کاروبارەکانی گرتەدەست. بەدوای ئەوە، هەموان لەرۆژی هەینی شەشی شەوال/ شەشی جولای کۆبوونەوە و داوای دادخوازییان لەو دەیلەمییانە کرد کەدەستیان بەسەرماڵەکانی ئەواندا گرتبوو. کورتکین وەڵامی نەدانەوە و خەڵکان ڕێگەیان نەدا وتار خوێن نوێژ و وتار بخوێنێت و رووبەرووی دەیلەمییەکان بوونەوە و ژمارەیەك لەهەردوو لا کوژران.

## گەڕانەوەی کوڕی رائیق بۆ بەغداد

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی رائیق لەشامەوە بەرەو بەغداد گەڕایەوە و پێگەی ئەمیری ئەمیرەکانی پێبڕا.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك تورکەکانی شوێنکەوتەی بەجکەم بۆ موسڵ هەڵاتن، لای کوڕی حەمدان بەمەبەستەکانی خۆیان نەگەیشتن لەبەر ئەمە بۆ پەیوەست بوون بەکوڕی رائیق بەرەو شام بەرێکەوتن. لەنێوان سەرکردەکانی وەك تەوزون، خەجخەج، نوشتەکین و سیغون دەبینرا. کاتێك ئەم دەستەیە گەیشتنە لای کوڕی رائیق، تەماحی گەڕانەوە بۆ بەغدادیان خستەبەر دەم. دواتر نامەکانی موتەقی بەدەست گەیشت کەپێشنیاری گەڕانەوەی پێدەکرد. کوڕی رائیق لەبیستی رەمەزان/ بیستی جون لەدیمەشقەوە بەرێکەوت و باوکی حەسەن ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی موقاتیلی وەك جێگری خۆی لەشام دەستنیشان کرد. کاتێك کوڕی

رائیق گەیشتە موسڵ، ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان ڕێگەی بۆ کردەوە. ئەم دوانە نامەیان بۆ یەك نووسی و ڕێگەی ئاشتی و سازانیان گرتەبەر و کوڕی حەمدان، سەد هەزار دیناری بۆ نارد و کوڕی رائیق درێژەی بەرێگەی بەغداددا و کاتێك گەیشت، کورتکینی قەراریتی وەزیری گرت و لەزیقەعدە/ جولای، باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسمی کەرخی وەك وەزیر هەڵبژارد. وەزارەتی قەراریتی چل و سێ رۆژ درێژەی کێشا.

هەواڵی کوڕی رائیق بەباوکی عەبدوڵلەی بورەیدی گەیشت. ئەو، براکانی بۆ واست نارد و ئەوان ڕۆشتنە ناو واست و دەیلەمییەکانیان لەو شارە دەرپەڕاند و بەناوی بورەیدی وتاریان خوێندەوە. کورتکین لەبەغدادەوە بەرەو عوکبرا بەرێکەوت و کوڕی رائیق پێی گەیشتە و لەنێوان ئەوان جەنگێکی چەند رۆژە روویدا.

لەشەوی پێنج شەممە، بیست و یەکی زیحەججە/ هەژدەی سێپتامبەر، کوڕی رائیق و سوپاکەی شەوانە لەعوکبرا ڕۆشتن و بەرەبەیانی گەیشتنە بەغداد و لەبەشی رۆژئاوا لەگەڵ هەموو سوپاکەی ڕۆشتە ناو شارەکە و لەنەجمی ئوردووی لێدا و بەیانی ئەو رۆژە بۆ بینینی خەلیفە بەرەو کۆشك بەرێکەوت. ئەم دوانە سوار لەسەر کەشتی لەدیجلەدا سووڕانەوە و دوای نیمەڕۆی ئەم رۆژە، کورتکین و سوپاکەی لەبەشی رۆژهەڵاتەوە هاتن. سەربازەکانی ئەو گاڵتەیان بەسەربازەکانی کوڕی رائیق دەکرد و دەیانوت: لەکوێیە ئەو کاروانەی لەشامەوە هاتووە؟ ئەوان لەبەشی رۆژهەڵاتی بەغداد ئوردوویان لێدا.

کاتێك کورتکین هاتە ناو بەغداد، کوڕی رائیف لەگرتنە دەستی کاروبارەکان بێ هیوا بوو و فەرمانیدا باروبنە بپێچنەوە و بەرەو شام بگەڕێنەوە. کاتێك سوپاکەی باروبنەیان پێچایەوە، کوڕی رائیق بڕیاریدا پێش ڕۆشتن لەگەڵ سوپاکەی کورتکین بجەنگێت. فەرمانی بەدەستەیەك لەسوپاکەیدا لەدیجلە بپەڕنەوە و لەپشتەوە هێرش بکەنە سەرتورکەکان. دواتر خۆی لەسەر بەلەمێك و ژمارەیەك لەسوپاکەی سوار بیست بەلەم بوون و تیربارانی تورکەکانیان دەستپێکرد. سوپاکەی ئەو بەدەم هاوار کردنەوە لەپشتەوە هێرشیان کرد و خەڵکی گەڕەکەکانیش پەیوەستیان بوون. کورتکین گومانی کرد سوپا لەهەموو قوڵێکەوە هێرشی کردۆتەسەر، لەبەر

ئەمە لەگەڵ سوپاکەی هەڵات و خۆی شاردەوە و خەڵکان خشتیان تێدەگرتن.

بەم شێوەیە کوڕی رائیق بەهێز بوو. هەردەیلەمییەك داوای ئەمانی لێدەکرد، دەیگرت و دەیکوشت. کوڕی رائیق نزیکەی چوارسەد کەس لەدەیلەمییەکانی کوشت و تەنیا یەك کەس لەوان کە لەناو کوژراوەکان خۆی شاردبوویەوە، گیانی دەرباز کرد. ئەم سەربازەیشیان لەگەڵ کوژراوەکان کردە ناو گوێنی و فڕیاندانە ناو دیجلە. بەڵام رزگاری بوو و بۆ چەندین ساڵی دیکە درێژەی بەژیاندا.[٢٤] زیاتر لەدە سەرکردەی دەیلەمی دوای گیران کوژران. موتەقی خەڵاتی بەکوڕی رائیق بەخشی و ئەوی وەك ئەمیری ئەمیرەکان هەڵبژارد و فەرمانی خانەنشینی بەباوکی جەعفەری کەرخیدا. ئەو سی و سێ رۆژ وەزیر بوو. ئەحمەدی کوفی جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست. دواتر کوڕی رائیق، کورتکینی گرت و لەکۆشکی خەلیفە زیندانی کرد.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا لەعێراق گرانی هاتە ئاراوە و خەڵکان لەمانگی رەبیع الاوەل/ ژانویە بۆ بارینی باران، نوێژە بارانەیان خوێند بەڵام تەنیا بارانێکی کەم باری و دووبارە گرانی پەرەی سەند و مردووەکان بەرادەیەك زیادیان کرد کەبێ کفن کردن لەناو گۆڕە بەکۆمەڵەکان بەخاك دەسپێردران و کەس نوێژی لەسەر ئەوان نەدەخوێند. زەمین و کەل و پەلی ناو ماڵ لەبەغداد بەرادەیەك هەرزان بوو کەئەوەی یەك دینار دەژیا، بەیەك درهەم دەفرۆشرا. تشرینی یەکەم و تشرینی دووەم و کانونی یەکەم و کانونی دووەم تێپەڕی کرد و جگە لەو بارانە کەمە، هیچی دیکە نەباری تا ئەوەی لەئازار و نیسان، باران بارین دەستی پێکرد.

لەشەوال/ جونی ئەم ساڵە موتەقی باللە، باوکی ئیسحاق محەممەد کوڕی ئەحمەدی ئیسکافی، ناسراو بەقەراریتی، دوای گەڕانەوەی بورەیدی لەبەغداد وەك وەزیر هەڵبژارد و بەدری خەرشەنی وەك پەردەداری خۆی دیاریکرد. قەراریتی تا

---

[٢٤]- کوڕی مەسکویە بەخوداکەرد ناوی دەبات. وەرگێڕ.

بیست و پێنجی زیقەعدە/ بیست و سێی ئۆگۆست وەزیر بوو تا ئەوەی کورتکین ئەوی گرت. وەزارەتی ئەو چل و سێ ڕۆژی خایاند. موتەقی دوای ئەو باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسمی کەرخی وەك وەزیر هەڵبژارد و ئەو تا بیست و هەشتی زیحەججە/ بیست و پێنجی ئۆگۆستی ئەو ساڵە وەك وەزیر مایەوە تا ئەوەی کوڕی رائیق لەکاتی گرتنی بەغداد، ئەوی لەسەر کار لابرد. وەزارەتی ئەو سی و دوو ڕۆژ زیاتری نەخایاند و کاروبارەکان کەوتە دەستی باوکی عەبدوڵلەی کوفی، دەبیری کوڕی رائیق، لەکاتێکدا وەزیر نەبوو.

لەم ساڵەدا حاجییەکان بۆ عێراق گەڕانەوە و نەگەیشتنە مەدینە چوونکە لەو دیارە پیاوێکی تالبی دەرکەوت کەپێگەی بەرز ببوویەوە.

لەم ساڵەدا چەندین جۆر تا و نەخۆشی جومگە لەناو خەڵکان زیادی کرد و هەرکەس خوێنی دەگرت، (کەڵەشاخ) بەخێرایی چاك دەبوویەوە و گەرنە گرفتاری نەخۆشییەکی درێژخایەن دەبوو.

لەرۆژگاری رازی، باوکی بیشر برای مەتا کوڕی یونسی حەکیمی فەیلەسوف مرد. ئەو بۆ شیکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەرستاتالیس چەندین نووسراوی هەیە.

لەزیحەججە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە بەختیشوع کوڕی یەحیای پزیشك مرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدوڵلەی بەلغەمی، وەزیری سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای خوراسان کەیەکێك لەبیرمەندەکان و زاناکانی ڕۆژگار بوو، مرد. نەسر لەساڵی ٩٣٧/٣٢٦ زایینی لەوەزارەت دوورخرایەوە و محەممەد کوڕی محەممەدی جیهانی جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی موزەفەری موحتاج مرد و لەسەغانییان بەخاك سپێردرا.

لەم ساڵەدا باوکی محەممەد حەسەن کوڕی عەلی کوڕی خەلەف بەربەهاری، پێشەوای حەنبەلییەکان، لەشوێنی مانەوەی خۆی مرد و لەئارامگای نەسری قەشوری بەخاك سپێردرا. ساڵەکانی ژیانی حەفتا و شەش ساڵ درێژەی کێشا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی کۆچی ( ٩٤٢ زایینی )

## وەزارەتی بورەیدی

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللەی بورەیدی وەك وەزیری موتەقی بالله دەستبەکار بوو.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کوڕی رائیق لەبورەیدی کە لەناردنی باج کەمتەرخەمی دەکرد، توڕە و لەدەی موحەرەم/ شەشی ئۆکتۆبەر هێرشی کردە سەر واست. مناڵەکانی بورەیدی بەرەو بەسرە هەڵاتن. باوکی عەبدوللەی کوق سەبارەت بەوان نێوەنجیگەری کرد و سەرئەنجام گەڕانەوە و بەڵێنی ناردنی پاشماوەی باجی واستیان بەبڕی سەد و نەوەد هەزار دیناردا و پەیمانیان بەست ساڵانە شەشسەد هەزار دینار باج ڕەوانەی بەغداد بکەن.

کوڕی رائیق بۆ بەغداد گەڕایەوە و سوپا لەدووی رەبیع الاخر/ بیست و شەشی دێسامبەر دژی ئەو شۆڕشیان کرد کەتەوزون و سەرکردەکانی دیکە لەناو ئەواندا دەبینران و لەدەیەی کۆتایی رەبیع الاخر/ دوای بیست و دووی ژانویە پەیوەستی باوکی عەبدوللەی بورەیدی لەواست بوون. کاتێك ئەم سوپایە گەیشتە لای باوکی عەبدولله، پێگەی بەرز بوویەوە و کوڕی رائیق ناچار بەبەستنی پەیمانی ئاشتی بوو، لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ باوکی عەبدوللەی بورەیدی نووسی و ئەوی وەك پالێوراوی وەزارەت هەڵبژارد و خەلاتی بۆ نارد. باوکی عەبدوللەی بورەیدی رازی و باوکی عەبدولله کوڕی شێرزادی وەك جێگری خۆی دیاریکرد. لەناو خەڵکان ئەم هەواڵە بلاو بوویەوە کەبورەیدی مەبەستی بەغدادی هەیە، لەبەر ئەمە کوڕی رائیقی ناوی ئەوی لەوەزارەت سڕییەوە و باوکی ئیسحاقی قەراریتی بۆ وەزارەت گەڕانەوە. لەهەردوو لای بەغداد بنەماڵەی بورەیدیان لەسەر مینبەرەکان نفرین دەکرد.

## زاڵبوونی بورەیدی لەبەغداد و ڕۆشتنی موتەقی بەرەو موسڵ

باوکی عەبدوللە بورەیدی براکەی باوکی حسەینی لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەتورکەکان و دەیلەمییەکان بەرەو بەغداد ڕەوانە کرد. کوڕی رائیق بڕیاریدا لەکۆشکی خەلافەت سەنگەر بگرێت. بۆ ئەم مەبەستە دیوارەکانی کۆشکی بەهێز کرد و لەویٚ و لەدیجلە چەندین بەردهاوێژی دانا و هەمووانی بۆ جەنگ کۆکردەوە و بەشێك لەسەربازەکانی وەك سەرباز بەخزمەت گرت. ئەم دەستەیە لەبەغداد ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و ئاگریان بەردایە هەموو شوێنێك و تالآنییان کردە پیشە و شەو و رۆژ رێگەیان لەخەڵك دەگرت.

موتەقی و کوڕی رائیق لەنیوەی جومادی الاخرە/ شەشی مارس بەرەو رووباری دیالە بەرێکەوتن و باوکی حسەین لەرێگەی ئاو و وشکانی پێیان گەیشتەوە و لەکوشتنی خەڵکان بەردەوام بوو. ئەو خەڵکانی لەکەنار رووباری دیجلە بوون، لەدوو لاوە دژی سوپاکەی بورەیدی لەئاو دەجەنگان تا ئەوەی خەڵکانەی بەغداد هەلآتن و سوپاکەی بوەریدی دەستیان بەسەر کۆشکی خەلیفەدا گرت و لەبیست و یەکی جومادی الاخرە/ دوانزەی مارس، لەرێگەی رووبارەوە ڕۆشتنە ناو شارەکە. موتەقی و کوڕەکەی ئەمیر باوکی مەنسور، لەگەڵ بیست سوار هەلآتن و کوڕی رائیق و سوپاکەی پێی گەیشتنەوە و هەموان رێگەی موسڵیان گرتەبەر و قەراریتی وەزیر خۆی شاردەوە. وەزارەتی دووەمی ئەو چل رۆژ و پێگەی ئەمیری ئەمیرەکانی کوڕی رائیق، شەش مانگ درێژەی کێشا. هاوەلآنی بورەیدی هەموو کەسانی ناو کۆشکی خەلیفەیان کوشت و کۆشك و ماڵەکانی دەوروبەریان تالآن کرد.

تالآن کردن لەبەغداد شەو و رۆژ درێژەی دەکێشا. ئەوان کورتکینیان لەزیندان هێنایەدەر و باوکی حسەین ئەوی بۆ لای براکەی لەواست ڕەوانە کرد و ئەمە کۆتایی رۆژگاری ئەو بوو. زیانیان لەقاهیر باللە نەدا ( ئەو کوێر بوو چوونکە چاوەکانیان پێشتر دەرهێنابوو. لەتجارب الامم ئاماژەی پێدراوە کە لەو ئاژاوەدا قاهیر باللە لەکۆشك هاتەدەر و سواڵکەری کردە پیشە و دەیوت: بەزەییتان بێتەوە

بەو کەسەی دوێنێ خەلیفەی ئێوە بوو.) باوکی حسەین لەماڵی مونس دابەزی و بەم شێوەیە تالاّن کردن پەرەی سەند. باوکی حسەین، تەوزونی وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی رۆژهەلاّتی بەغداد و نوشتەکینی وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی رۆژئاوا هەڵبژارد و خەڵك هێدی هێدی هێور بوونەوە. باوکی حسەینی بورەیدی، لەو سەرکردانەی لەگەڵ تەوزون و کەسانی وەك ئەو بوون، چەندین کەسی وەك بارمتە لای خۆی هێشتەوە و ژن و منالّەکانی ئەوانی بۆ لای باوکی عەبدوللەی برای، لەواست ڕەوانە کرد.

## کردەوەکانی بورەیدی لەبەغداد

کاتێك بورەیدی دەستی بەسەر بەغدادا گرت، سوپاکەی تالاّنی و گرتنی چوارپێکانیان دەست پێکرد. داوای چوارپێکانیان دەکرد بۆ بارکردنی کەل و پەلەکانی دیکە. ئەوان هەموو مالّەکانیان گرت و دانیشتوانەکانیان لەمالّەکان دەرکرد و خۆیان تیایدا جێگیر بوون. بەهای هەر کوڕ[٢٥] گەنم، جۆ یا هەر دانەوێڵەیەکی دیکە کە بەپێنج دینار دەکرا و دەفرۆشرا، بۆ سێسەد و شانزە دینار بەرز بوویەوە. دوو ڕەتلْ نانی برژاو بەدوو قیراتی ئەمیری دەفرۆشرا و ئەهەلی زەممە، گرفتار بوون. بەهێزەکان ئازاری ناتەوانەکانیان دەدا.

لەکوفە و دەوروبەری نزیکەی پێنسەد کوڕ جۆ و گەنم گەیشتە بەغداد و بورەیدی دەستی بەسەر هەموویدا گرت و رایگەیاند کارگوزاری کوفە بۆ ئەوی ڕەوانە کردووە.

ئاژاوە لەنێوان خەڵکان سەری هەڵدا تا ئەو جێگەی لەنێوان دەستەیەك لەقەرەمتییەکان کەهاورێی ئەو بوون، لەگەڵ تورکەکان شەڕ هاتە ئاراوە و ژمارەیەك کوژران و قەرەمتییەکان هەلاّتن و بەغدادیان بەجێهێشت.

هەروەها لەنێوان دەیلەمییەکان و خەڵکی گەڕەك و کۆلاّنەکان جەنگ روویدا کەپانتاییەکەی لەرووباری تابق تا پردی جەدید بوو. دەستەیەکیش لەم جەنگەدا

---

[٢٥] کێشێکە بەرابەر لەگەڵ ١٥٦٠٠٠ درهەم، هاوکێشی ٣٠ مەن. وەرگێر

کوژران.

لەکۆتایی شەعبان/ ئاوریلی ئەم ساڵە، بەلا و گرفتاری سەر شانی خەڵکان زیادی کرد و شەو و ڕۆژ ماڵەکانیان تالان دەکرا و زۆربەی کارگوزارەکان لەبەر داواکاری ئەوەی لەتوانای ئەواندا نەبوو، خۆیان شاردبوویەوە. دووبەرەکی لەناو خەڵکان هاتە ئاراوە و دەستەیەك لەگەڵ هاوەلانی خەلیفە، لەبەغداد نزیك کەوتنەوە و جۆ و گەنمی نەکوتراویان (بێ ئەوەی شەن کرابێت) بۆ ماڵەکانی خۆیان دەبرد و لەگەڵ ئەمەیشدا خەڵکانی عێراق تالان دەکران و ستەمیان لێدەکرا، ستەمێك کەهاوشێوەی نەبینراوە.

ئاماژەمان بەم بەشەدا تا هەموان بزانن کردەوەی ستەمکاران دەگێڕدرێتەوە و لەرۆژگاردا دەمێنێتەوە کەتەنانەت لەبەر ڕەزامەندی خواوەند دەستیان لەستەم هەڵنەگرتووە.

## کوژرانی کوڕی رائیق و فەرمانڕەوای کوڕی حەمدان

موتەقی پەیکی بەدوای ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان نارد و بۆ سەرکوت کردنی سوپاکەی بورەیدی داوای هاوکاری کردبوو. ناسر ئەلدەولە، سەیف ئەلدەولە عەلی کوڕی عەبدوللە کوڕی حەمدانی برای بەهاوڕێیەتی سوپایەکی گەورە بۆ هاوکاری ئەو نارد. سەیف ئەلدەولە، لەتکریت چاوی بەموتەقی و کوڕی رائیق کەوت کەهەردووکیان هەلاتبوون. سەیف ئەلدەولە ڕێزی لەموتەقی گرت و لەگەڵ ئەو بەرەو موسڵ بەرێکەوت. ناسر ئەلدەولە لەشار هاتەدەر و بەرەو رۆژهەلاتی دیجلە بەرێکەوت و رووی کردە مەعلسایا. لەنێوان ئەو کوڕی رائیق نوێنەرەکان هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی رێککەوتن. ناسرئەلدەولە گەڕایەوە و لەرۆژهەلاتی دیجلە دابەزی. ئەمیر باوکی مەنسور کوڕی موتەقی و کوڕی رائیق لەروبار پەڕینەوە و ڕۆشتنە لای ناسر ئەلدەولە و سلاویان بۆ نارد و ناسر ئەلدەولە درهەم و دیناری بەسەر کوڕی موتەقیدا پرژاند. کاتێك ئەو دووانە مەبەستی گەڕانەوەیان کرد و کوڕی موتەقی سوار ئەسپ بوو و کوڕی رائیق ویستی سوار ئەسپەکەی خۆی بێت، ناسرئەلدەولە پێی وت: ئەمرۆ لای ئێمە بمێنەرەوە تا

سەبارەت بەپێشهاتەکان گفتوگۆ بکەین. کوڕی رائیق، هاورێیەتی کوڕی موتەقی کردە بەڵام کوڕی حەمدان پێداگری کرد. کوڕی رائیق نیگەران و قۆڵی عاباکەی لەدەست ناسر ئەلدەولە راکێشا و دڕا و کاتێك ویستی سوار ئەسپەکەی بێت، ئەسپەکەی ڕەمی کرد و کەوتە سەرزەوی. کوڕی حەمدان فەرمانی بەسوپاکەیدا: بیکوژن، بیکوژن و فڕێبدەنە ناو دیجلە.

کوڕی حەمدان دواتر کەسی بۆ لای موتەقی نارد: دەیزانی کەکوڕی رائیق مەبەستی کوشتنی ئەوەی لەسەردا بووە و لەبەر ئەمە کوشتوویەتی. موتەقی وەڵامێکی شیاوی بۆ ناردەوە و فەرمانی پێدا بڕواتە لای. کوڕی حەمدان ڕۆشتە لای موتەقی و موتەقی، خەڵاتی پێبەخشی و ئەوی بەنازناوی ناسرئەلدەولە بانگ کرد و پێگەی ئەمیری ئەمیرەکانی پێبەخشی. ئەم پێشهاتە لەسەرەتای شەعبان/ ئاوریل ڕوویدا. موتەقی هەروەها خەڵاتی بەبراکەی ناسر، باوکی حسەیندا و نازناوی سەیف ئەلدەلەی پێبەخشی.

کوژرانی کوڕی رائیق لەرۆژی دووشەممە بیست و یەکی ڕەجەب/ سیانزەی ئاوریل ڕوویدا. کاتێك کوڕی رائیق کوژرا، ئەخشید لەمیسرەوە هێرشی کردە سەر دیمەشق. دیمەشق لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی محەممەد کوڕی یەزداد، جێگری کوڕی رائیق بوو. ئەو داوای ئەمانی لەئەخشید کرد و دیمەشقی تەسلیم کرد. ئەخشید ئەوی وەك فەرمانڕەوای دیمەشق هێشتەوە و دواتر لەگەڵ خۆی بەرەو میسری برد و وەك فەرماندەی پاسەوانەکان هەڵیبژارد. دەڵێن کوڕی رائیق هۆنراوەی جوانی دەهۆنییەوە، یەکیان ئەمەیە:

| | |
|---|---|
| يصفر وجهى اذا تأمله | طرفى و يحمر وجهه حجلا |
| حتى كان الذى بوجنته | من دم قلبى اليه قد نقلا |

دەستەیەك ئەمە بەهۆنراوەی خەلیفە رازی دەزانن کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

## گەڕانەوەی موتەقی بۆ بەغداد و هەڵاتنی کوڕی بورەیدی

کاتێك باوکی حسەینی بورەیدی دەستی بەسەر بەغداد گرت و وەك ئاماژەمان پێدا خراپەکاری و ستەمکاری گرتەبەر، خەڵك و سوپاییەکان لێی بێزار بوون و کاتێك کوڕی رائیق کوژرا، سوپا بەخێرایی لەدەست بورەیدی هەڵاتن. خەجخەج کەبورەیدی ئەوی وەك کارگوزاری رازانات و کەنارەکانی دەستنیشان کردبوو، بۆ لای موتەقی هەڵات. دواتر تەوزون و نوشتەکین و تورکەکان بریاریاندا باوکی حسەینی بورەیدی سەرکوت بکەن. نوشتەکین رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و بورەیدی ئاگادار کردەوە. بورەیدی چاودێری بارودۆخی خۆی دەکرد و دەیلەمییەکانی لای خۆی هێشتەوە. کاتێك تەوزون مەبەستی ئەوی کرد و دەیلەمییەکان ڕووبەڕووی بوونەوە و تەوزون بەفێڵەکەی نوشتەکینی زانی، لەپێنجی رەمەزان/ بیست و پێنجی مەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەتورکەکان بەرەو موسڵ بەرێکەوت و کوڕی حەمدان بەهۆی ئەوانەوە بەهێز و مەبەستی هاتن بۆ بەغدادی کرد و لەگەڵ موتەقی سوپای رازاندەوە و بەرێکەوت. باوکی حەسەن عەلی کوڕی تەیابی وەك لێپرسراوی باج و زەوییەکانی دیاری موزێر (رۆها، حەران و رەققە) راسپارد و بەرەو موسڵ ڕەوانەی کرد.

باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی موقاتیل، نوێنەری کوڕی رائیق، فەرمانڕەوایەتی دیاری موزێری دەکرد. جەنگ روویدا و باوکی حسەین کوڕی موقاتیل کوژرا و کوڕی تەیاب دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. کاتێك موتەقی و ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان لەبەغداد نزیك بوونەوە، باوکی حسەینی بورەیدی بەرەو واست هەڵات و خەڵکانی گەڕەك و کۆڵانەکانی بەغداد دوای ئەم پێشهاتە سەرقاڵی تاڵان کردنی یەکتر بوون. باوکی حسەینی بورەیدی سێ مانگ و بیست رۆژ لەبەغداد مایەوە. موتەقی لەگەڵ مناڵەکانی حەمدان و سوپایەکی فراوان بۆ بەغداد گەڕایەوە و باوکی ئیسحاقی قەراریتی وەك وەزیر هەڵبژارد و فەرماندەیی پاسەوانەکانی هەردوولای بەغداد بەتەوزون سپارد. ئەم پێشهاتە لەمانگی شەوال/ جون روویدا.

## جەنگی کوڕی حەمدان و بورەیدی

کاتێك باوکی حسەینی بورەیدی بەرەو واست هەلآت و منالەکانی حەمدان و موتەقی گەیشتنە بەغداد، منالەکانی حەمدان لەبەغدادەوە هێرشیان کردە سەر واست و باوکی حسەینی بورەیدیش بەپێچەوانەوە لەواستەوە هێرشی کردە سەر بەغداد. ناسرئەلدەولە لەمەدائین مایەوە و سەیف ئەلدولەی برای و کوڕە مامەکەی باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی سەعید کوڕی حەمدانی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی باوکی حسەینی بورەیدی ڕەوانە کرد. دوو سوپا لەدوو فەرسەخی مەدائین رووبەرووی یەکبوونەوە و چەند رۆژێك بەجەنگەوە سەرقاڵ بوون کەکۆتاییەکەی چواری زیحەججە/ بیست و یەکی ئۆگۆست بوو. تەوزون، خەجخەج و تورەکان لەگەڵ کوڕی حەمدان بوون. سەیف ئەلدەولە و سوپاکەی شکستیان خوارد و بەرەو مەدائین هەلآتن کە لەژێر فەرمانی ناسرئەلدەولەدا بوو. ناسرئەلدەولە ئەوانی لەگەڵ سوپایەکی گەورەتر گەڕاندەوە و دووبارە روویان کردە گۆڕەپانی جەنگ و ئەمجارە باوکی حسەینی بورەیدی هەلآت و دەستەیەك لەهاوەڵە گەورەکانی ئەسیر کران و ژمارەیەکیان کوژران. باوکی حسەینی بورەیدی تێکشکاو بۆ واست گەڕایەوە و سەیف ئەلدەولە بەهۆی کەمتەرخەمی و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی شوێنی نەکەوت.

موتەقی کەبنەماڵەکەی خۆی لەبەغدادەوە بۆ سامەرا ناردبوو، ئەوانی گەڕاندەوە. گەورەکانی بەغدادیش کەلەو شارە هەلآتبوون، بەتێکشکانی باوکی حسەینی بورەیدی، بۆ بەغداد گەڕانەوە. ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان لەسیانزەی زیحەججە/ سی ئۆگۆست گەڕایەوە بۆ بەغداد. لەپێشیەوە ئەسیرەکان سوار وشتر کرابوون. کاتێك سەیف ئەلدەولە و سوپاکەی حەسانەوە، لەگۆڕەپانی جەنگەوە بەرەو واست بەرێکەوتن. بینیان سوپای کوڕی بورەیدی بەرەو بەسرە دەڕوات. سەیف ئەلدەولە و سوپاکەی لەواست مانەوە و لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ٩٤٣/٣٣١ درێژە بەبەسەرهاتی ئەو دەدەین.

کاتێك ناسرئەلدەولە گەڕایەوە بۆ بەغداد، دەستی بەجیاکردنەوەی دینارەکان

کرد و بینی زۆربەیان دەسکردن. لەبەر ئەمە فەرمانی لێدانی دینارە ناسراوەکان بەناوی ئەبریزیە درا کەبەهای لەدینارەکانی دیکە زیاتر بوو. بەهای دینارەکانی دیکە دە درهەم بەلاّم ئەم جۆرە دینارە بەسیانزە درهەم دەفرۆشرا.

## زاڵبوونی دەیلەمییەکان لەئازەربایەجان

ئازەربایەجان لەژێر فەرمانی دەیسەم کوڕی ئیبراهیمی کوردی بوو کەهاورێیەتی یوسف کوڕی باوکی ساجی دەکرد و بەرادەیەك لەخزمەتی ئەودا مایەوە تا دەسەلاّتی بەسەر ئازەربایەجاندا گرت. ئەو و باوکی شوێنکەوتەی ئایینی شارییەکان (کڕیارەکان، یانی خۆیان بۆ جیهاد کڕیوە و ئەوانە خەواریج بوون و هەرکەس لەناو ئەوان دەردەکەوت، بەشاری ناوی دەبرا) بوون. باوکی لەهاوەلاّنی هارونی شاری بوو و کاتێك هارون کوژرا، بۆ ئازەربایەجان هەلاّت و لەگەڵ کچی یەکێك لەگەورەکانی کورد پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەم کچە، دەیسەمی بۆ هێنایە دنیا و دەیسەم، پەیوەستی باوکی ساج بوو. پێگەی بەرز بوویەوە تا ئەو جێگەی دوای یوسف کوڕی باوکی ساج، فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجانی گرتەدەست. کوردەکان بەشی زۆری سوپاکەی ئەویان پێکدەهێنا جگە لەدەستەیەکی کەمیان کە لەدەیلەمییەکان و سوپاکەی وەشمگیر بوون و بەهۆی هاورێیەتی ئەو لەئازەربایەجان مابوونەوە.

دواتر کوردەکان بەهێز بوون و دەستیان بەسەر بەشێك لەقەلاّکان و سنوورەکانی ژێر دەسەلاّتی دەیسەمدا گرت. دەیسەم بەباشی زانی داوای هاوکاری لەدەیلەمییەکان بکات، بۆ ئەم مەبەستە ژمارەی دەیلەمییەکانی سوپاکەی زیاد کرد. سەعلوك کوڕی محەممەد کوڕی موسافیر و عەلی کوڕی فەزڵ و کەسانی دیکە لەناو دەیلەمییەکاندا دەبینران. دەیسەم ڕێزی گرتن و چاکەکاری لەگەڵ ئەوان کردە پیشە و ئەوەی کوردەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، وەریگرتەوە و ژمارەیەك لەسەرکردە کوردەکانی ئەسیر کرد.

وەزیری دەیسەم، باوکی قاسم کوڕی جەعفەر، لەخەڵکانی ئازەربایەجان بوو. دوژمنەکانی دەیسەمیان دژی ئەو هاندا. دەیسەم ئەوی ترساند و باوکی قاسم بۆ

لای تورەم کوڕی محەممەد کوڕی موسافیر هەڵات. کاتێك گەیشتە ئەویٚ، دوو کوڕەکەی محەممەد کوڕی موسافیر، وەهسوزان و مەرزبانی بینی کە لەترسی باوکیان هەڵاتبوون و دەستیان بەسەر چەندین قەڵادا گرتبوو. هۆکاری ترسی ئەوان خراپەکاری باوکیان بوو. دواتر ئەم دوانە باوکیان قۆڵبەست و دەستیان بەسەر سامان و گەنجینەکانی ئەودا گرت و چیتر لەقەڵایەکی دیکە بیٚ هیچ توێشوو و توانێك مایەوە. کاتێك عەلی کوڕی جەعفەر ئەمەی بینی، لەمەرزبان و خزمەتکارەکانی نزیك بوویەوە و تەماحی گرتنی ئازەربایەجانی خستە بەردەم مەرزبان و بەڵێنی سامانێکی زۆری پێدا چوونکە گەورەکانی ئازەربایەجانی دەناسی. مەرزبان ئەوی وەك وەزیری خۆی هەڵبژارد.

ئەوەی ئەم دوانەی کۆدەکردەوە – جگە لەوەی ئاماژەمان پێدا– ئەمەیە کەهەردووکیان شیعە بوون. عەلی کوڕی جەعفەر لەبانگەشەکەرانی باتنییە و مەرزبانیش بەلایەنگیری کردن لەم ئایینە بەناوبانگ بوو. دەیسەم وەك ئاماژەمان پێدا شوێنکەوتەی ئایینی خەواریج و تۆڵەسەندنەوە لەشوێنکەوتەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. لەبەر ئەمە ئەو دەیلەمییانەی لەدەوری ئەو کۆببوونەوە، بەجێیان هێشت. عەلی کوڕی جەعفەر نامەی بۆ ئەم کەسانە نووسی و دڵنەوایی کردن. زۆربەی هاوەڵانی دەیسەم وەڵامیان دایەوە و لەدەیسەم توڕە بوون بەتایبەت دەیلەمییەکان کەپێشتر لێی جیاببوونەوە. مەرزبان هێرشی کردە سەر ئازەربایەجان و دەیسمیش ڕووبەڕووی بوویەوە. کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، دەیلەمییەکان پەیوەستی مەرزبان بوون و بەدوای ئەوە، ژمارەیەکی بەرچاو لەکوردەکان داوای ئەمانیان کرد. مەرزبان هێرشی کردە سەردەیسەم. دەیسەم شکستی خوارد و لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەهاوەڵانی بەرەو ئەرمەنستان هەڵات و پەنای بردە حاجیق کوڕی دەیرانی کەهاوڕێی یەکتر بوون. حاجیق ڕێزی گرت و دەیسەم دووبارە کوردەکانی کۆکردەوە. کەسە نزیکەکانی دەیلەم پێشنیاریان پێکرد لەدەیلەمییەکان خۆی دووربخاتەوە چوونکە لەنەژاد و نەتەوەدا جیاوازن. دەیسەم گرنگی بەوتەکانی ئەوان نەدا. مەرزبان دەستی بەسەر ئازەربایەجاندا گرت و جڵەوی کاروباری لەدەستدا بوو تا ئەو کاتەی لەنێوان ئەو و وەزیرەکەی، عەلی

کوڕی جەعفەر، ناسازگاری هاتە ئاراوە.

چۆنیەتی ئەم ناسازگارییە بەم شێوە بوو: عەلی بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ هاوەڵانی مەرزبان دەکرد. لەبەر ئەمە هەموان دژی ئەو یەکیانگرت و کاتێك لەمە ئاگادار بوویەوە، فێڵی لەمەرزبان کرد و ئەوی بۆ گرتنی سامانی خەڵکانی تەبرێز هاندا. مەرزبان سوپایەکی لەدەیلەمییەکان کۆکردەوە و لەگەڵ ئەو ڕەوانەی تەبرێزی کردن. عەلی ڕێزی لەخەڵکی شارەکە گرت و ئەوانی ئاگادار کردەوە کەمەرزبان ئەم سوپایەی بۆ زەوت کردنی سامانی ئەوان ڕەوانە کردووە و خەڵکی شارەکەی هاندا تا دەیلەمییەکانی ناو سوپاکەی کوشتار بکەن و نامە بۆ دەیسەم بنووسن تا بڕواتە لایان. عەلی نامەیەکی بۆ دەیسەم نووسی و خەڵکی تەبرێز دژی دەیلەمییەکان شۆڕشیان کرد و ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشت. دەیسەم لەگەڵ سوپاکەی خۆی ڕێگەی تەبرێزی گرتەبەر. مەرزبان لەگەڵ ئەو کوردانەی داوای ئەمانیان لێکردبوو، بەشێوەیەکی ستەمکارانە هەڵس و کەوتی دەکرد و لەبەر ئەمە کوردەکان لەگەڵ ئاگادار بوون لەهەواڵی هاتنی دەیسەم بۆ پەیوەست بوون پێی، بەرەو تەبرێز ئەسپیان غاردا. کاتێك مەرزبان لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە، لەدوورخستنەوەی عەلی کوڕی جەعفەر پەشیمان بوویەوە. دواتر سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و ڕێگەی تەبرێزی گرتەبەر و لەدەرەوەی شارەکە ڕووبەڕووی دەیسەم بوویەوە. دەیسەم و کوردەکان شکستیان خوارد و پەنایان بۆ تەبرێز برد و لەناو شارەکە سەنگەریان گرت. مەرزبان گەمارۆی خستە سەریان و بەناردنی نامە دەیویست ئاشتی لەگەڵ عەلی کوڕی جەعفەر بکات و سوێندی بۆ خوارد، هەرچی بخوازێت، پێی دەدات. عەلی بەم شێوەیە وەڵامی مەرزبانی دایەوە: لەوەی دەخوازیت بەمنی ببەخشی، هیچم ناوێت، مەگەر ئەوەی زیانم بەرنەکەوێت و لەکاروبارەکان بەدوور بم. مەرزبان بەوتەکەی ڕازی و سوێندی بۆ خوارد.

گەمارۆکەی سەر دەیسەم دژوار و لەتەبرێزەوە بەرەو ئەردەبیل هەڵات و عەلی کوڕی جەعفەر ڕۆشتە لای مەرزبان و هەموان هێرشیان کردە سەر ئەردەبیل. مەرزبان کەسانێکی لەتەبرێز دانا تا درێژە بەگەمارۆکە بدەن. مەرزبان، لەئەردەبیل گەمارۆی خستە سەردەیسەم و کاتێك ئەم گەمارۆیە درێژەی کێشا، دەیسەم

ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر و لەمبارەوە چەندین نامەی بۆ مەرزبان نووسی. مەرزبان ڕازی بوو و پەیمانی ئاشتی لەنێوانیان واژۆ کرا. مەرزبان، ڕێزی لەدەیسەم گرت و سوێند و پەیمانەکەی خۆی بردەسەر. دواتر دەیسەم، ترسا مەرزبان بیکوژێت و داوای لێکرد بۆ قەڵای تورەمی بنێرێت تا لەگەڵ ژن و مناڵەکەی خۆی لەوێ بێت و بەداهاتی ئەوێ بەسەندە بکات و هیچی دیکەی ناوێت. مەرزبان ئەو کارەی کرد و دەیسەم و ژن و منالەکەی لەو قەڵایە مانەوە.

## زاڵبوونی باوکی عەلی کوڕی موحتاج لەسەرزەمینی چیاکان و فەرمانبەری وەشمگیر لەسامانییەکان

لەڕووداوەکانی ساڵی ٩٤١/٣٢٩ زایینی وتمان باوکی عەلی کوڕی موحتاج فەرماندەی سوپاییەکانی خوراسان لەلایەن سامانییەکان، ڕێگەی ڕەی گرتەبەر و وەشمگیری لەو شارە دەرپەڕاند. وتمان وەشمگیر ڕێگەی تەبەرستانی گرتەبەر و باوکی عەلی دوای زاڵبوونی لەڕەی، ئەو زستانەی لەو شارە بەسەر برد و سوپاکەی خۆی بەرەو چیاکان ڕەوانە کرد و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت و شارەکانی زەنکان، ئەبهەر، قەزوین، قوم، کەرەج، هەمەدان، نەهاوەند و دەینەوەر تا سنوورەکانی حیلوانی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و لەهەر شارێك کارگوزارێکی دانا و باجی کۆکردەوە.

حەسەن کوڕی فیرزان، فەرمانڕەوایەتی ساری دەکرد، وەشمگیر مەبەستی ئەو شارەی کرد و گەمارۆی خستەسەر. حەسەن ڕۆشتە لای باوکی عەلی و داوای هاوکاری لێکرد. وەشمگیر لەساری سەنگەری گرت. باوکی عەلی لەگەڵ حەسەن هێرشیان کردە سەر وەشمگیر و لەساڵی ٩٤٢/٣٣٠ ناکاوگیریان کرد. بارودۆخ بۆ وەشمگیر دژوار بوو. باوکی عەلی هەموو ڕۆژێك بۆ جەنگ پێداگری دەکرد و سوپاکەی وەشمگیر لەزستانێکی سەخت و سارد، ژیانیان بەسەر دەبرد. وەشمگیر داوای کرد کاتێکی دیکە بۆ جەنگ دیاریبکەن. باوکی عەلی ڕەزامەندی نیشاندا و چەندین بارمتەی لێ سەند تا سەرپێچی فەرمانەکانی ئەمیر نەسر کوڕی ئەحمەدی

سامانی نەکات و لەجومادی الاخرەی ٣٣١/ فەروریەی زایینی، لەشاری سارییەوە بەرەو جورجان بەرێکەوت و لەم کاتەدا هەواڵی مەرگی ئەمیر نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی پێگەیشت و لەجورجانەوە رێگەی خوراسانی گرتەبەر.

## زاڵبوونی حەسەن کوڕی فیرزان لەجورجان

حەسەن کوڕی فیرزان کوڕە مامی ماکان کوڕی کالی و لەبوێریدا هاوشێوەی ئەو بوو. کاتێك ماکان کوژرا، وەشمگیر نامەیەکی بۆ نووسی تا ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشان بدات، بەڵام فیرزان ئەو کارەی نەکرد. ئەو کە لەساری دەژیا، جوێنی بەوەشمگیر دەدا و گومانی دەکرد وەشمگیر لەکوژرانی ماکان هاودەست بووە. وەشمگیر هێرشی کردەسەر و حەسەن لەسارییەوە بۆ پەیوەست بوون بەباوکی عەلی، فەرماندەی سوپای خوراسان، بەرێکەوت و داوای هاوکاری لێکرد. باوکی عەلی لەگەڵ ئەو هێرشی کردە سەر ساری و وەشمگیر گەیشتە ساری و لەساڵی /٩٤٣/٣٣١ زایینی گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە و دواتر ئەم دووانە رێککەوتن.

باوکی عەلی بۆ خوراسان گەڕایەوە و کوڕەکەی وەشمگیر، بەناوی سالاری وەك بارمتە گرت. حەسەن کوڕی فیرزان لەگەڵ ئەودا بوو بەڵام بەم ئاشتییە دڵخۆش نەبوو تا ئەوەی هەواڵی مەرگی ئەمیر نەسر کوڕی ئەحمە ، سامانی، فەرمانڕەوای خوراسان بەباوکی عەلی گەیشت و کاتێك حەسەن هەواڵەکەی بیست، مەبەستی کوشتنی باوکی عەلی کرد. بۆ ئەم مەبەستە هێرشی کردە سەر باوکی عەلی و سوپاکەی. باوکی عەلی زیندوو مایەوە و حەسەن سنوورەکانی فەرمانڕەوایەتی ئەوی تالان کرد و کوڕەکەی وەشمگیری گرت و بۆ جورجان گەڕایەوە و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. بەهەمان شێوە دامغان و سمنانی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. کاتێك باوکی عەلی گەیشتە نەیشابور، ئیبراهیم کوڕی سیمجوری دەواتی بەناسازگاری خۆی بینی. نێردراوەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان کرد و سەرئەنجام هەردووك رێگەی ئاشتییان گرتەبەر.

## زاڵبوونی وەشمگیر لەڕەی

کاتێك باوکی عەلی بۆ خوراسان گەڕایەوە و لەلایەن حەسەن کوڕی فیرزان ئەو بەڵای بەسەرهات کەئاماژەمان پێدا و بۆ جورجان گەڕایەوە، وەشمگیر لەتەبەرستانەوە ڕۆشتە ڕەی و دەستی بەسەردا گرت. حەسەن کوڕی فیرزان نامەی بۆ نووسی و دڵنەوایی کردەوە و سالاری کوڕی کەوەك بارمتە لای باوکی عەلی بوو، ئازاد کرد. مەبەستی لەم کارە ئەوە بوو ئەگەر سوپای خوراسان بۆ جەنگی ئەو بگەڕێتەوە، بتوانێت کەڵك لەهاوڕێیەتی وەشمگیر وەربگرێت. وەشمگیر بەنەرمی وەڵامی دایەوە و ئامارەی بەناسازگاری خۆی لەگەڵ باوکی عەلی نەدا.

## زاڵبوونی ڕۆکن ئەلدەولە لەڕەی

کاتێك ڕۆکن ئەلدەولە و براکەی عیماد ئەلدەولە، دوو کوڕەکەی بویە، لەهەواڵی زاڵبوونی وەشمگیر لەڕەی ئاگادار بوونەوە، چاوی تەماحیان تێبڕی چوونکە وەشمگیر ناتەوان و بەهۆی جەنگ لەگەڵ باوکی عەلی، هێز و توانا و توێشووی لەدەستدا بوو. بەم پێیە، ڕۆکن ئەلدەولە حەسەن کوڕی بویە هێرشی کردە سەر ڕەی و جەنگی لەگەڵ وەشمگیر دەستپێکرد. وەشمگیر هەڵات و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی داوای ئەمانیان لەڕۆکن ئەلدەولە کرد. وەشمگیر بەرەو تەبەرستان هەڵات و حەسەن کوڕی فیرزان مەبەستی ئەوی کرد و لەم کاتەیشدا ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی وەشمگیر داوای ئەمانیان لەحەسەن کرد. وەشمگیر بەناچاری بۆ خوراسان هەڵات.

دواتر حەسەن کوڕی فیرزان نامەی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە نووسی و پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەست. ڕۆکن ئەلدەولە کچی حەسەنی کردە هاوسەری خۆی ولەو ژنە کوڕێکی بۆ هاتەدنیا بەناوی عیماد ئەلدەولە عەلی.

شیاو بوو ئەم ڕووداوانە دوای مەرگی سەعید نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی ئامارەی پێبدرێت بەڵام ئاماژەمان پێدا تا ڕووداوەکان لەیەك نەپچڕێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بەدری خەرشەنی لەپەردەداری خەلیفە دوورخرایەوە و سەلامەی تولونی جێگەی گرتەوە.

لەموحەرەم/ سێپتامبەری ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی کلکداری گەورە لەسەرەتای بورجی کوڵکەزێڕینە و کۆتایی بورجی دووپشك لەنێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاّت دەرکەوت. سەری ئەم ئەستێرەیە لەڕۆژئاوا و کۆتاییەکەی لەڕۆژهەلاّت و کلکێکی گەورەی بوو کەبۆ ماوەی سیانزە ڕۆژ دەبینرا. دواتر ڕۆشت و چیتر نەبینرا.

هەروەها لەم ساڵەدا بەتایبەت لەعێراق گرانی ڕوویدا و چوار ڕەتڵ نان بەدوو قیراتی ئەمیری دەفرۆشرا. هەژارەکان مردوویان دەخوارد و کۆڵیرا و مەرگ بەرێژەیەکی بەرچاو زیادی کرد.

لەرەبیع الاخر/ دێسامبەری ئەم ساڵە ڕۆمییەکان لەحەلەب نزیك بوونەوە و شارەکانیان تالاّن و وێران و نزیکەی پانزە هەزار کەسیان ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا سەمەلی لەکەنارەکانی تەرسوس هێرشی کردە سەر ڕۆم، کوشتی و بڕی و بێ زیان گەڕایەوە و ژمارەیەك لەسەرکردە ناودارەکانی ئەوانی ئەسیر کرد.

لەزیقەعدە/ جولای ئەم ساڵە، خەلیفە موتەقی، بەدری خەرشەنی وەك لێپرسراوی ڕێگەی فورات دەستنیشان کرد. ئەو بۆ وەر ـتنی ئەمان ڕۆشتە لای ئەخشید و ئەخشید دیمەشقی خستە ژێر فەرمانی ئەو بەلاّم دوای ماوەیەك نەخۆش کەوت و مرد.

لەجومادی الاخرە/ فەوریەی ئەم ساڵە باوکی مەنسوری بویە کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە یا هەمان مۆئەییەد ئەلدەولە چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەبدوللە، ناسراو بەسەیرەفی، فەقیهی شافعی، کەچەندین نووسراوی لەفیقەدا هەیە، مرد.

لەم ساڵەدا قازی باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیلی موحاملی، فەقیهی شافعی کەشارەزای حەدیس بوو، مرد. ئەو لەساڵی ٨٤٩/٢٣٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو قازی کوفە و فارس بوو و

بەپێداگرییەوە داوای دەستە لەکار کێشانەوەی دەکرد و سەرئەنجام بەخواستەکەی رازی بوون.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیل کوڕی باوکی بیشری ئەشعەری موتەکەلیم، سەرۆکی ئایینی ئەشعەری مرد. ئەو لەساڵی ٨٧٣/٢٦٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو لەوەچەی باوکی موسای ئەشعەری (ئەبوموسا) بوو.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی محەممەدی جیهانی، وەزیری سەعید نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانی لەژێر داروپەردوو گیانیدا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یوسف کوڕی نەزری هیرەوی، فەقیهی شافعی، مرد. لەساڵی ٨٤٣/٢٢٩ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو لای رەبیع کوڕی سلێمان، هاوڕێی شافعی، زانست فێر بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و یەکی کۆچی ( ٩٤٢ زایینی )

## سەرکەوتنی ناسر ئەلدەولە بەسەر عەدلی بەجکەمی

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی سەعید کوڕی حەمدان سەرکەوتنی بەسەر عەدل، پەردەداری بەجکەم، بەدەست هێنا و سۆمای چاوی لێ سەندنەوە و بەرەو بەغداد ڕەوانەی کرد.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: عەدل دوای کوژرانی بەجکەم، پەیوەستی کوڕی رائیق بوو و لەگەڵ ئەو ڕۆشتە بەغداد و لەرۆشتن بۆ موسڵ هاورێیەتی کرد. کاتێك ناسرئەلدەولە، کوڕی رائیقی کوشت – وەك ئاماژەی پێدرا– عەدل پەیوەستی ناسرئەلدەولە بوو و ناسر ئەلدەولە ئەوی لەگەڵ عەلی کوڕی خەلەف کوڕی تەیاب بۆ دیاری میسر و شام کە لەژێر فەرمانی کوڕی رائیقدا بوو، ڕەوانە کرد. پیاوێك بەناوی موسافیر کوڕی حەسەن بەنوێنەرایەتی کوڕی رائیق فەرمانڕەوایەتی ڕەحبەی دەکرد و کاتێك کوڕی رائیق کوژرا، موسافیر دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت و بەرگری لێکرد و باجی کۆکردەوە. کوڕی تەیاب، عەدلی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد تا لەرەحبە دووری بخاتەوە. کاتێك عەدل گەیشتە ئەو سەرزەمینە، موسافیر بێ جەنگ ڕەحبەی تەسلیم کرد و عەدل فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی گرتەدەست و نامەی بۆ هاوەڵانی بەجکەم لەبەغداد نووسی و ئەوانی بۆ پەیوەست بوون بەخۆی هاندا. هاوەڵانی بەجکەم بەشێوەیەکی نهێنی پەیوەستی بوون و هێزی عەدل بەهۆی ئەوانەوە زیادی کرد و دەستی بەسەر ڕێگەی فورات و چەند ناوچەیەکی خابوردا گرت.

دواتر موسافیر دەستەیەکی لەمناڵەکانی نومەیر کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر قێرقیسیا و هاوەڵانی عەدلی لەوێ دەرپەڕاند و دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرت.

عەدل بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. موسافیر خۆی شاردەوە و عەدل مەبەستی ئەوەی کرد خابور بخاتە ژێر فەرمانی خۆی. خەڵکانی خابور وشیار بوونەوە و داوای هاوکارییان لەمناڵەکانی نومەیر کرد. کاتێك عەدل لەمەبەستی ئەوان ئاگادار

بوویەوە، چیتر مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەوانی نەکرد.

ئەو هەموو ڕۆژێك کاژێرێك پێش ئاوابوونی هەتاو، لەگەڵ سوپاییەکانی سوار ئەسپ دەبوو و تا کۆتایی ڕۆژ لەدەشتی قێرقیسیا دەگەڕا و سیخوڕەکانی هەواڵەکانی تایبەت بەدانیشتوانی خابوریان بۆ دەهێنا کەخەڵکانی خابور هەرکاتێك لەجموجۆڵی ئەو ئاگادار دەبنەوە، وشیاری دەکەنە پیشە. چل ڕۆژ ئەم کارەیان دووبارە کردەوە و کاتێك خەڵکانی خابور دەیانبینی سوار ئەسپ دەبێت بەڵام مەبەستی ئەوان ناکات، بلاوەیان لێکرد و لەهێرش نەکردنی ئەو دڵنیا بوون. سیخوڕەکان لەم پێشهاتە ئاگاداریان کردەوە. کاتێك سەربازەکانی عەدل بەژمارەی پێویست کۆبوونەوە، ئەوانی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان کۆیلەکان بۆ گواستنەوەی بارەکان ڕەوانە بکەن. خۆی دەستبەجێ بەرێکەوت و بەرەبەیان گەیشتە شەماسییە کە یەکێك لەگەورەترین و بەهێزترین گوندەکانی خابور بوو. خەڵکی گوندەکە سەنگەریان گرت و عەدل ڕووبەڕوویان بوویەوە و چەند کەلێنێکی لەدیوارەکەدا دروست کرد و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. ژمارەیەکی کوشت و سامانێکی زۆری لەدانیشتوانەکەی سەند. چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە و دواتر بەرەو ناوچەکانی دیکە بەرێکەوت. شەش مانگ لەخابور ئوردووی لێدا. باج و سامانێکی زۆری کۆکردەوە و هێزی زیادی کرد. سوپاکەی بەئەندازەی پێویست بەهێز بوون و عەدل بۆ ڕەحبە گەڕایەوە و بارودۆخی سەقامیگر و پێگەی بەرز بوویەوە. بەبەردەوامی سەربازەکان لەبەغدادەوە پەیوەستی دەبوون.

دواتر مەبەستی نەسیبینی کرد چوونکە دەیزانی ناسرئەلدەولە لەموسڵ و سەرزەمینەکانی جەزیرە دوورە و ناتوانێت هێرش بکاتە سەر ڕەققە و حەڕان لەبەر ئەوەی یەئنسی مونسی لەگەڵ سوپاکەی خۆی و دەستەیەك لەمناڵەکانی نومەیر لەوێ نیشتەجێیە. عەدل خابوری بەجێهێشت و ڕووی کردە ڕەئس عەین و لەوێوە ڕێگەی نەسیبینی گرتەبەر. هەواڵی پێشڕەوی ئەو بەسوپاکەی حسەین کوڕی حەمدان گەیشت. حسەین سوپای کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر نەسیبین. کاتێك لەنەسیبین نزیك کەوتەوە، عەدل و سوپاکەی ڕووبەڕووی بوونەوە. کاتێك ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند، سوپاکەی عەدل داوای ئەمانیان لەکوڕی حەمدان

تەنیا چەند کەس لەگەورەکان لەگەڵ عەدل مانەوە. کوڕی حەمدان، عەدل و کوڕەکەی گرت و سۆمای چاوی لێسەندنەوە و هەردووکیانی ڕەوانەی بەغداد کرد. عەدل و کوڕەکەی لەبیستی شەعبان/ یەکی مەی بەریسوایی بڕانە ناو بەغداد.

## سەیف ئەلدەولە لەواست

پێشتر ئاماژەماندا بەپێگە و جێگەی سەیف ئەلدەولە عەلی کوڕی حەمدان لەواست دوای ڕۆشتنی هاوەڵانی بورەیدی لەم شارە. ئەو دەیویست لەواستەوە ڕێگەی بەسرە بگرێتەبەر و دەستی بەسەردا بگرێت بەڵام لەبەر نەبوونی پارە بەمەبەستەکەی خۆی نەگەیشت. نامەیەکی بۆ براکەی نووسی بەڵام ئەویش هیچی بۆ نەنارد. تەوزون و خەجخەج زۆریان لێدەکرد.

دواتر ناسرئەلدەولە بەباوکی عەبدوڵلەی کوفی پارەی بۆ براکەی نارد تا لەنێوان تورکەکان بڵاوی بکاتەوە. تەوزون و خەجخەج (لەهاتنی پارەکە ئاگادار ببوونەوە) جوێنیان بەباوکی عەبدوڵلەی کوفیدا و دژی ئەو راپەڕین. سەیف ئەلدەولە پارەکەی وەرگرت و لەو دوانەی شاردەوە و ڕەوانەی بەغدادی کرد. ئەو فەرمانی بەتەوزوندا بەرەو جامیدە بڕوات و فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیە بگرێتەدەست و داهاتەکەی بۆ خۆی هەڵگرێت. هەروەها فەرمانی بەخەجخەجدا ڕێگەی مەزار بگرێتەبەر و بیپارێزێت و سامانەکەی بۆ خۆی کۆبکاتەوە.

سەیف، عێراقی لەبەرچاوی تورکەکان کەم بەها کرد و ئەوانی بۆ گرتنی شام و میسر هان دەدا و خراپەی براکەی خۆی دەهێنایە سەرزمان. تورکەکان نازیان پێدەفرۆشت و ئەو داواکارییەکانی ئەوانی دەهێنایەدی.

لەکۆتایی شەعبانی ئەم ساڵە/ نۆی مەی، تورکەکان دژی سەیف ئەلدەولە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و شەوانە سەرکوتیان کرد. سەیف لەئوردووگاکەی بەرەو بەغداد هەڵات و سامانەکەی تاڵان کرا و ژمارەیەك لەهاوەڵانی کوژران.

کاتێك باوکی عەبدوڵلەی کوفی گەیشتە لای ناسرئەلدەولە و لەهەواڵەکان ئاگاداری کردەوە، ناسرئەلدەولە بەباشی زانی بەرەو موسڵ بەڕێکەوێت بەڵام موتەقی هاتەلای و ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرت. ناسر ئەلدەولە رازی بوو بەڵام کاتێك

موتەقی گەڕایەوە، ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و لەم کاتەدا تورك و دەیلەمییەکان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەستدرێژییان کردە سەرماڵەکەی. باوکی عەبدوللەی قەراریتی بیٚ ئەوەی وەزیر بێت، کاروبارەکانی رادەپەڕاند.

فەرمانڕەوایی ناسرئەلدەولە کوڕی محەممەد حسەین کوڕی عەبدولله کوڕی حەمدان لەبەغداد سیانزە مانگ و پێنج ڕۆژ درێژەی کێشا و باوکی عەباسی ئیسفەهانی پەنجا و یەك ڕۆژ وەزیر بوو. سەیف ئەلدەولە گەیشتە بەغداد.

بارودۆخی تورکەکان دوای ڕۆشتنی سەیف ئەلدەولە

کاتێك سەیف ئەلدەولە لەواست هەڵات، تورکەکان بۆ ئوردووگای خۆیان گەڕانەوە و لەنێوان تەوزون و خەجخەج ناسازگاری هاتە ئاراوە و لەسەر گرتنەدەستی کاروبارەکان کێشە لەنێوانیان سەری هەڵدا و سەرئەنجام لەسەر ئەوە ڕێککەوتن تەوزون ببێتە فەرمانڕەوا و خەجخەج سوپاسالار و هەردووك پەیوەندی زاوایەتییان لەگەڵ یەك بەست.

بورەیدی چاوی تەماحی بڕییە واست و بەرەو ئەو شارە بەڕێکەوت. تەوزون فەرمانی بەخەجخەجدا بەرەو ڕووباری ئەبان بەڕێکەوێت. بورەیدی پەیامی بۆ تەوزون نارد تا بەڵێنی ناردنی باجی واست بدات. تەوزون بەشێوەیەکی نەرم وەڵامی دایەوە بەلآم ئەو کارەی نەکرد و کاتێك نوێنەری بورەیدی گەڕایەوە، تەوزون سیخوڕێکی لەگەڵ نارد تا هەواڵەکانی ئەو و خەجخەجی پیٚ بگەیێنێت. کاتێك سیخوڕ گەڕایەوە، تەوزونی ئاگادار کردەوە کەبورەیدی لەگەڵ خەجخەج گفتوگۆی کردووە و خەجخەج دەخوازێت پەیوەستی ببێت. تەوزون لەگەڵ دووسەد کۆیلەی بڕواپێکراو بەخێرایی بۆ لای خەجخەج بەڕێکەوت و لەشەوی دوانزەی ڕەمەزان/ بیست و یەکی مەی، لەکاتێکدا خەوتبوو، لەسەر سەری دابەزی. کاتێك خەجخەج لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، بەجل و بەرگەکانی بەری وتەور بەدەست سوار ئەسپەکەی بوو و بەرگری لەخۆی کرد بەلآم پاش کەمێك گرتیان و بردیانە لای تەوزون. تەوزون ڕەوانەی واستی کرد. تەوزون لەدووەم ڕۆژی گەیشتنی سۆمای چاوی لەخەجخەج سەندەوە و دواتر ئەوی بۆ واست نارد.

## ڕۆشتنی سەیف ئەلدەولە بۆ بەغداد و هەڵاتنی لەو شارە

کاتێك -ئاماژەمان پێدا- هەڵات، پەیوەستی براکەی بوو و لەم کاتەدا لەناسازگاری نێوان تەوزون و خەجخەج ئاگادار بوویەوە و بەمشێوەیە چاوی تەماحی بڕییە گرتنی بەغداد. ئەو بەرەو بەغداد بەرێکەوت و لەباب حەرب (دەروازەی جەنگ) ئوردووی لێدا و داوای پارەی لەخەلیفە موتەقی کرد تا ئەگەر تەوزون مەبەستی هێرش کردنە سەر بەغدادی کرد، ڕووبەڕووی بێتەوە.

موتەقی چوارسەد هەزار درهەمی بۆ نارد. سەیف ئەم پارەی لەناو سوپاکەی دابەش کرد و ئەوەی لەبەغداد خۆی شاردبوویەوە، هاتەدەر و پەیوەستی سوپاکەی بوو. ئەو لەسیانزەی ڕەمەزان/ بیست و دووی مەی گەیشتە بەغداد.

کاتێك تەوزون ئاگادار بوو لەوەی سەیف ئەلدەولە گەیشتۆتە بەغداد، کەیغەلغی لەگەڵ سێسەد جەنگاوەر لەواست بەجێهێشت و خۆی بەرەو بەغداد بەرێکەوت. کاتێك سەیف ئەلدەولە لەهێرشی تەوزون ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ هەموو سوپاکەی کەحەسەن کوڕی هارون لەناویاندا دەبینرا، دەروازەی حەربی بەجێهێشت و هەڵات.

## فەرمانڕەوایی تەوزون

پێشتر وتمان سەیف ئەلدەولە بەغدادی بەجێهێشت و کاتێك هەڵات، تەوزون هاتە ناو بەغداد. هاتنە ناوەوەی ئەو بۆ بەغداد لەبیست و پێنجی ڕەمەزان/ چواری جون بوو. موتەقی خەڵاتی پێبەخشی و ئەوی کردە ئەمیر ئەمیرەکان. باوکی جەعفەری کەرخی ڕاوێژکار و پێشکاری تەوزون هاوشێوەی باوکی عەبدوڵلەی کوفی کاروبارەکانی ڕادەپەڕاند.

کاتێك تەوزون واستی بەجێهێشت، بورەیدی هێرشی کردە سەر شارەکە. سوپاکەی تەوزون لەواست هەڵات و تەوزونیش نەیتوانی دوای ڕێکخستن و سەقامگیر کردنی بارودۆخی بەغداد بەرەو واست بڕوات لەبەر ئەوە تا چەند ڕۆژێك لەزیقەعدە/ جولای لەبەغداد مایەوە.

تەوزون یەکێك لەکۆیلە بەرێزەکانی سەیف ئەلدەولەی ئەسیر کرد کە بەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی ئەو هەژمار دەکرا. ئەو، ئەم کۆیلەی ئازاد کرد کەبەسەمال ناویان دەبرد. رێزی گرت وبۆ لای سەیف ئەلدەولەی ڕەوانە کردەوە. ئەم کردەوەیە پێگەی تەوزونی لای منالەکانی حەمدان بەرز کردەوە. دواتر تەوزون بەرەو واست ئەسپی غاردا و مەبەستی هێرش کردنە سەر بورەیدی کرد. باوکی جەعفەر کوڕی شێرزاد لای بورەیدی هەلآت و خۆی گەیاندە سوپاکەی تەوزون. تەوزون بەخێرهێنانی کرد و کاروبارەکانی خۆی بەو سپارد.

## ڕۆشتنی فەرمانڕەوای عەمان بۆ بەسرە

لەزیحەججە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە یوسف کوڕی وەجیە، فەرمانڕەوای عەمان، لەگەڵ چەندین کەشتی مەبەستی بەسرەی کرد و ئاگری جەنگی دژی بورەیدی هەڵگیرساند و ئوبلەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و هێزێکی زۆری پێبڕا و ئەوەندی نەمابوو فەرمانڕەوایەتی بەسرە بگرێتەدەست. بورەیدی و براکانی لەمرگ نزیك بوونەوە.

بورەیدی کەشتیوانێکی بوو بەناوی ڕەنادی کەبەڵێنیدا شکست بەیوسف کوڕی وەجیە بێنێت. لەبەرابەردا بورەیدیش چەندین بەڵێنی پێدا. ئەم کەسە دوو بەلەمی هەڵگرت و بەگەڵا و لقی وشك بووی دارخورما ئاخنی. کەسی لەکار و مەبەستەکەی خۆی ئاگادار نەکردەوە و لەشەودا بەلەمەکانی خستە ناو ئاو تا لەئوبلە نزیك بوونەوە.

کەشتییەکانی کوڕی وەجیە شەوانە بەیەکەوە دەبەسترانەوە و لەتەنیشت یەك هاوشێوەی پردێك بەرچاو دەکەوتن. کاتێك شەو گەیشتە نیوە، ئەو پیاوە گڕی بەردایە دوو بەلەمەکە و لەگەڵ ڕەوتی ئاو بەرەو لای کەشتییەکانی نارد. ئەو دوو بەلەمە لەبا خێراتر ڕێگەیان دەبڕی تا ئەوەی گەیشتنە کەشتییەکانی کوڕی وەجیە. ئاگر لەکەشتییەکان بەربوو و تەناف لەنگەرەکان سووتان و ئەوەی لەناو کەشتییەکاندا بوو، گڕی گرت. خەڵك سامانێکی زۆریان لەکەشتییەکان تالآن کرد و یوسف کوڕی وەجیە لەموحەرەمی ساڵی ٩٤٣/٣٣٢ زایینی هەلآت. بورەیدی

بەڵێنەکانی خۆی بردەسەر. لەکاتی ئەم جەنگە کوڕی شێرزاد لەناو سوپاکەی بورەیدی هەڵات و پەیوەستی تەوزون بوو.

## لێڵ بوونی پەیوەندییەکانی نێوان موتەقی باڵله و تەوزون

محەممەد کوڕی یەنالی تەرجومان یەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی تەوزون بوو و جێگری ئەو لەبەغداد هەژمار دەکرا. کاتێك تەوزون گەیشتە واست، لای ئەو خراپەی محەممەدیان هێنایە سەرزمان و بەشێوەیەکی قێزەون لای تەوزون ئاماژەیان بەناوی ئەودا. بەم شێوەیە محەممەد خوازیاری جیابوونەوە لەتەوزون بوو.

لەو کاتەدا باوکی حسەین کوڕی موقلەی وەزیر، گوندە تایبەتییەکانی تەوزونی لەکەنارەکانی بەغداد لەو بەکرێ گرتبوو و بەڵێنی بڕێك پارەی پێدابوو بەڵام لەهەموو گوندەکاندا رووبەرووی زەرەر و زیان بوویەوە. باوکی حسەین لەوە ترسا تەوزون لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکات و لەم رۆژانەیشدا بوو کوڕی شێرزاد پەنای بۆ تەوزون برد. وەزیر و کەسانی دیکە ترسان و گومانیان کرد پەنا بردنی ئەو بۆ تەوزون لەپیلان و دەسیسەکانی ئەو لەگەڵ بورەیدی سەرچاوەی گرتووە.

تەرجومان و کوڕی موقلە بوونە یەك و نامەیان بۆ کوڕی حەمدان نووسی تا سوپایەك (تەنانەت ئەگەر ژمارەیان کەم بێت) بۆ لای خەلیفە موتەقی ڕەوانە بکات. ئەوان بەخەلیفەیان وت: ئایا نەتبینی دوێنێ بورەیدی چ بەڵایەکی بەسەر تۆدا هێنا و چۆن پێنسەد هەزار دیناری لێ سەندی و بەهەمان ئەندازەت بۆ سوپاکە خەرج کرد، بورەیدی بەڵێنی داوە پێنسەد هەزار دینار بۆ تەوزون وەربگرێت و رایگەیاندووە ئەم بڕە پارەی لەبەجکەم ماوەتەوە، لەدەستی تۆدایە، هەنووکە شێرزاد هاتووە تا ئەو بڕە پارە لەتۆ وەربگرێت و تۆ لەخەلافەت دوور بخاتەوە وتەسلیمی بورەیدیت بکات. موتەقی ڕەنجا و مەبەستی ئەوەی کرد بڕواتە لای کوڕی حەمدان. لەم کاتەدا کوڕی شێرزاد لەگەڵ سێسەد سوارچاك گەیشت.

## مەرگی نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی

لەرەجەب/ مارسی ئەم ساڵە سەعید نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سەلمانی فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرا ئەلنەهر، بەهۆی نەخۆشی سیل لەپێ کەوت. بۆ ماوەی سیانزە مانگ نەخۆش بوو و چیتر کەس لەگەورەکانی بنەماڵەی سامانی زیندوو نەبوون. ئەوان بەرادەیەك بۆ لەناو بردنی یەکتر هەوڵیاندا کەدەستەیەکیان لەم ڕێگەدا کوژران و دەستەیەکیان لەناو جێگەدا. فەرمانڕەوایی ئەو سی ساڵ و سی و سێ ڕۆژ درێژەی کێشا و ساڵەکانی ژیانی لەسی و هەشت کۆتایی پێهات.

ئەو پیاوێکی خۆڕاگر، بەخشندە و بیرمەند بوو. لەبەڵگەکان بۆ خۆڕاگر بوونی ئەو ئەمەیە: ڕۆژێك کۆیلەکەی گەوهەرێکی گرانبایی لێ دزی و بەبەهای سیانزە هەزار درهەم بەبازرگانێکی فرۆشت. بازرگان خۆی هاتە لای سەعید و ئاگاداری کردەوە کەگەوهەرێکی کڕیوە و تەنیا شیاوی ئەمیرە. گەوهەرەکەی بردە لای ئەمیر. کاتێك گەوهەرەکەی بینی، زانی لەخۆی دزراوە. ئەمیر پرسیاری لەبازرگان کرد بەچ بەهایەك ئەو گەوهەرەی کریوە و ئەوەی لەکێی کڕیوە؟ بازرگان، کۆیلە و بەهاکەی وت. ئەمیر فەرمانیدا دەستبەجێ بەهاکەیان هێنا و دوو هەزار درهەمی خستەسەر.

بازرگان داوای لەئەمیر کرد لەکوشتنی کۆیلەکەی چاوبپۆشێت. ئەمیر وتی: بەناچاری دەبێت ئەدەب بکرێت بەلاّم خوێنی ئەوم بەتۆ بەخشی. ئەمیر کۆیلەکەی هێنا و ئەدەبی کرد. دواتر ئەوی بۆ لای بازرگان نارد و وتی: خوێنی ئەوم بەتۆ بەخشی و هەنووکە ئەو بۆ لای تۆ دەنێرم. ئەگەر خاوەنی ئەم گەوهەرە یەکێك لەخەڵکان بوو دەیوت: ئەمە سامانی منە کەدوای ئەوەی لێم دزراوە، بۆ من گەڕاوەتەوە و تۆ پارەی خۆت لەکەسێك وەربگرە کەپێت داوە.

دەگێڕنەوە ڕۆژێك نەسر کوڕی ئەحمەد بەناو سوپاکەی خۆیدا دەگەڕا. لەناو سوپاکە سەربازێك دەبینرا بەناوی نەسر کوڕی ئەحمەد(هاوناوی نەسر کوڕی ئەحمەدی ئەمیر) کاتێك لەبەردەم ئەمیر گوزەری کرد، ئەمیر وەستانی و پرسیاری ناوەکەی کرد. سەربازەکە بێدەنگ بوو. ئەمیر دووبارە پرسی و سەرباز دووبارە وەڵامی نەدایەوە. یەکێك لەکەسانی دەوروبەر وتی: ئەو ناوی نەسر کوڕی

ئەحمەدە و لەبەر ڕێزگرتن لەئەمیر بێدەنگ بووە. سەعید وتی: کەواتە دەبێت مافی بۆ بگێڕینەوە و ڕۆژانەکەی زیاد بکەین. دواتر ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و مانگانەی بۆ زیاد کرد.

دەگێڕنەوە کاتێك براکەی باوکی زەکەریا دژی ئەو ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە، گەنجینە و سامانەکانی تالآن کرد و کاتێك سەعید دووبارە فەرمانڕەوایەتی بەدەست هێنایەوە، ناوی دەستەیەکیان هێنایە سەرزمان کەسامان و داراییەکانیان تالآن کردبوو بەلآم ئەو توندی لەگەڵ کەس نەنواند. پێیان وت یەکێك لەبازرگانەکان کێردێکی گرانبایی لەسامانەکانی ئەو بەدووسەد درهەم کڕیوە. کەسی بۆ لای ئەو پیاوە نارد و دووسەد درهەمەکەی بۆ گەڕاندەوە و داوای کێردەکەی کرد. بازرگان تەنیا بەوەرگرتنی هەزار درهەم بەفرۆشتنی کێردەکە ڕازی بوو. سەعید وتی: ئایا سەرتان لەو سوڕنەماوە، سامانەکەی خۆم لای ئەو دەبینم، سزای نادەم و مافی خۆی بۆ دەگێڕمەوە. بازرگان بۆ وەرگرتنی هەزار دینارەکە پێداگری کرد و سەعید فەرمانیدا ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنن.

دەگێڕنەوە نەخۆشی ئەو سیانزە مانگ درێژەی کێشا. ئەو بەردەوام سەرقاڵی نوێژ خوێندن و پاڕانەوە بوو. لەکۆشکەکەی ژوورێکیان بۆ دروست کرد و ناوی ناو پەرستشگە. بەردەوام جل و بەرگی خاوێنی دەپۆشی و پێ پەتی دەڕۆشتە ئەو ژوورە و نوێژی دەخوێند و دەپاڕایەوە و لەگوناح و خراپەکاری خۆی بەدوور دەگرت تا ئەوەی مرد و لای باوکی بەخاك سپێردرا.

## فەرمانڕەوای کوڕی نەسر کوڕی ئەحمەد، ئەمیر نوح کوڕی نەسر

کاتێك نەسر کوڕی ئەحمەد مرد، کوڕەکەی نوح، فەرمانڕەوایەتی خوراسان و ماوەرائەلنەهری گرتەدەست و لەشەعبان/ مارسی ئەم ساڵە خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست و سوێندیان بۆ خوارد و نازناوی ئەمیر حەمید یان پێ بەخشی. کارەکانی ئەو و بەڕێوەبردنی وڵات بەباوکی فەزڵ محەممەد کوڕی ئەحمەدی حاکم سپێردرا.

کاتێك نوح لەسەر تەخت دانیشت، باوکی فەزڵ کوڕی ئەحمەد کوڕی حەمویە کەیەکێك لەهاوڕێ نزیکەکانی باوکی بوو، هەڵات. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ئەمیر سەعید نەسر، ئیسماعیلی کوڕی وەك فەرمانڕەوای بوخارا دەستنیشان کرد و باوکی فەزڵ کەپێشکار و راوێژکاری ئیسماعیل بوو، لەگەڵ نوح و هاوەڵانی رێگەی خراپەخوازی گرتەبەر و نوح ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و دواتر ئیسماعیل لەسەردەمی باوکی، مرد.،

نەسر خوازیاری باوکی فەزڵ بوو و ئەوی هەڵدەبژارد. رۆژێك پێی وت: ئەگەر من مردم، تۆ خۆت رزگار بکە چوونکە دەترسم نوح هێرش بکاتە سەر تۆ. لەبەر ئەمە کاتێك ئەمیر نەسر مرد، باوکی فەزڵ بوخارای بەجێهێشت و لەجەیحون پەڕییەوە و ڕۆشتە ئامول و لەگەڵ باوکی عەلی کوڕی موحتاج کە لەنەیشابور بوو، نامەیان ئاڵ و گۆڕ کرد و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری کردەوە. باوکی عەلی لەوەڵامدا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی رێگەی نەدا بڕواتە ئەو دیارە.

لەم کاتەدا ئەمیر نوح بەدەستی خۆی ئەمان نامەی بۆ باوکی فەزڵ نارد. باوکی فەزڵ گەڕایەوە و نوح چاکەکاری لەگەڵ کرد و ئەوی وەك فەرمانڕەوای سەمەرقەند هەڵبژارد. باوکی فەزڵ، لەمحەممەد کوڕی ئەحمەدی حاکم خۆی دوور دەخستەوە. ئەویان بەخەیات ناو دەبرد. حاکمیش ڕقی ئەوی لەدڵدا بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەموحەرەم/ سێپتامبەری ئەم ساڵە، مۆعێزئەلدەولە کوڕی بویە گەیشتە بەسرە و ڕووبەڕووی سوپاکەی بورەیدی بوویەوە و ماوەیەکیان بەجەنگ بەسەر برد. دواتر دەستەیەك لەهاوەڵانی داوای ئەمانیان لەسوپاکەی بورەیدی کرد و پەیوەستی ئەوان بوون. ئەو ترسا فەرماندەکانی دیکەیش ڕێگەی ئەوان بگرنەبەر (پەیوەستی بورەیدی ببن) لەبەر ئەمە بەسرەی بەجێهێشت و گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا ئەمیر باوکی مەنسور کوڕی موتەقی باللە لەگەڵ کچی ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان پەیوەندی ژن و مێردایەتی بەست و مارەیی ئەو بەهەزار هەزار درهەم دیاریکرا و سەد هەزار دینار شیربابییان پێدا.

لەم ساڵەدا ناسرئەلدەولە، باوکی ئیسحاقی قەراریتی قۆڵبەست کرد و لەمانگی ڕەجەب/ مارس، باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵەی ئیسفەهانی لەجێگەی ئەو دانا. بەڵام باوکی عەبدوڵڵەی کوفی کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد. قەراریتی هەشت مانگ و شەش ڕۆژ وەزیر بوو. ناسرئەلدەولە لێکۆڵینەوەی لەگرفتاری خەڵکان دەکرد و خۆی هاوشێوەی فەرماندەی پاسەوانەکان بەکاروبارەکانەوە سەرقاڵ دەبوو.

لەم ساڵەدا ئەردهەژێنێکی گەورە کەنارەکانی نەسای لەخوراسان هەژاند و چەندین ئاوەدانی وێران کرد و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەژێر داروپەردوودا مردن. ئەم ئەردهەژێنە زۆر گەورە بوو.

لەم ساڵەدا ئەمیر نوح، محەممەد کوڕی نەسەفی بەردهی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد. لای نوح خراپەی ئەویان هێنابوویە سەرزمان. نوحی ئەوی کوشت و چوارمێخەی کێشا. جەنازەکەی ئەویان داگرت و فڕاندیان و کەس نەیزانی کێ ئەو کارەی کردووە.

لەهەشتی ڕەمەزان/ حەڤدەی مەی ئەم ساڵە دوای گەڕانەوەی ناسرئەلدەولە لەبەغدادەوە بۆ موسڵ و پێش هاتنی براکەی لەواستەوە بۆ بەغداد، باوکی حسەین کوڕی موقلە، وەك وەزیری خەلیفە موتەقی دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا پاشای ڕۆم نوێنەرێکی بۆ لای خەلیفە نارد و داوای ئەو دەستماڵەی

لێکرد کەگومانی دەکرد مەسیح بەوە روخساری خۆی سڕییەوە و نەخشی روخساری لەناو دەستماڵەکەدا نەخشی بەستووە. ئەو پەیامی نارد ئەگەر ئەو دەستماڵەی بۆ بنێرێت ژمارەیەك لەئەسیرە موسوڵمانەکان ئازاد دەکات. موتەقی قازی و فەقیهەکانی کۆکردەوە و داوای فتوای لێکردن. ئەوان ناسازگار بوون. دەستەیەك پێیان وابوو دەستماڵەکە بۆ پاشای رۆم بنێرن و ئەسیرەکان ئازاد بکەن و دەستەیەك بیریان دەکردەوە ئەم دەستماڵە لەکۆنەوە لەناو سەرزەمینی موسوڵمانان بووە و هیچ کام لەپاشاکانی رۆم داوای نەکردووە و ئەگەر ئێستا بۆی بنێردرێت، بەهای و پێگەی موسوڵمانان کەم دەکاتەوە.

عەلی کوڕی عیسای وەزیر لەناو ئەم دەستەیە دەبینرا. وتی: رزگار کردنی موسوڵمانان لەهێشتنەوەی ئەم دەستماڵە باشترە. خەلیفە فەرمانیدا دەستماڵەکەیان بۆ بنێرن و ئەسیرەکان ئازاد بکەن. ئەو کارەیان کرد و کەسیان بۆ لای پاشای رۆم نارد و ئەسیرەکان ئازاد کران.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی ئیسماعیلی فەرغانی سۆفی، مامۆستای ئەبوبەکری دەقاق، کۆچی دوایی کرد. ئەو لەناو شێخەکان بەناوبانگ بوو.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی یەزدادی شارەزووری کە بەنوێنەرایەتی محەممەد کوڕی رائیق کاروبارەکانی دیمەشقی رادەپەڕاند و پەیوەستی ئەخشید بوو و ئەخشید ئەوی وەك فەرماندەی پاسەوانەکانی میسر دەستنیشان کرد، مرد.

لەم ساڵەدا سەنان کوڕی سابت کوڕی قورە لەسەرەتای زیقەعدە/ جولای بەهۆی نەخۆشی سکچوونەوە مرد. هەرچەند لەپزیشکیدا کەسێکی شارەزا و کارامە بوو، بەڵام نەبووە هۆی ئەوەی بتوانێت خۆی لەمردن رزگار بکات.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی عەبدوسی جەهشیاری، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و دووی کۆچی ( ٩٤٣ و ٩٤٤ زایینی )

### ڕۆشتنی موتەقی بۆ موسڵ

لەم ساڵەدا خەلیفە موتەقی بەرەو موسڵ بەرێکەوت.

چۆنیەتییەکەی – وەك ئاماژەمان پێدا – بەم شێوە بوو: کوڕی موقلە و تەرجومان لای موتەقی خراپەی تەوزون و کوڕی شێرزادیان هێنایە سەرزمان. دواتر کوڕی شێرزاد لەپێنجی موحەرەم/ نۆی دێسامبەر لەگەڵ سێسەد سوارچاك گەیشتە بەغداد و موتەقی لەهاتنی ئەو ترسا. شێرزاد لەبەغداد مایەوە و فەرمانی دەدا و لەهیچ کارێکدا راوێژی بەموتەقی نەدەکرد.

موتەقی کەسی بۆ لای ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان ناردبوو تا سوپایەکی بۆ بنێرێت بۆ ئەوەی بیبەن بۆ موسڵ. ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان سوپایەکی بەفەرماندەیی کوڕە مامەکەی باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی سەعید کوڕی حەمدان ڕەوانە کرد. کاتێك ئەم سوپایە گەیشتنە بەغداد، لای دەروازەی حەرب دابەزین و شێرزاد خۆی شاردەوە. موتەقی لەگەڵ بنەماڵەکەی، کەسانی دەورووبەر، وەزیر و گەورەکانی بەغداد وەك سەلامەی تولونی، باوکی زەکەریا یەحیا کوڕی سەعیدی سوسی، باوکی محەممەدی ماردانی، باوکی ئیسحاقی قەراریتی، باوکی عەبدوللەی موسەوی، سابت کوڕی سەنان کوڕی سابت کوڕی قورەی پزیشك، باوکی نەسر محەممەد کوڕی یەنالی تەرجومان و کەسانی دیکە لەگەڵ ئەو سوپایە بەرەو موسڵ بەرێکەوت.

کاتێك موتەقی بەغدادی بەجێهێشت، کوڕی شێرزاد ستەمکاری و زۆرداری کردە پیشە و سامانی خەڵکانی زەوت کرد. شێرزاد، تەوزونی(لەواست بوو) لەبارودۆخی خۆی ئاگادار کردەوە. بەم شێوەیە تەوزون واستی بۆ بورەیدی بەجێهێشت و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری ئەو و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر. سەیف ئەلدەولەیش بەتەنیایی بۆ پەیوەست بوون بەخەلیفە موتەقی بەرەو تکریت بەرێکەوت. موتەقی پەیامی بۆ ناسرئەلدەولە نارد و ئەوی بۆ بارەگاکەی خۆی

بانگ کرد و وتی: پەیمان ئەوە بوو بێیتە لای ئێمە. ناسرئەلدەولە بەرێکەوت و لەبیست و یەکی رەبیع الاوەل/ سیانزەی ژانویە گەیشتە تکریت. موتەقی خۆی بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشت و ڕێزی گرت. خەلیفە بەرەو موسڵ بەرێکەوت و ناسرئەلدەولە لەتکریت مایەوە. تەوزون هێرشی کردە سەر تکریت و لەدوو فەرسەخی تکریت، ڕووبەڕووی سوپاکەی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان بوویەوە. ئەم دوو سوپایە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەکوشتاری یەکتر سەرقاڵ بوون و لەرۆژی چوارەم، بیست و حەوتی رەبیع الاوەل/ بیست و نۆی دێسامبەر، سەیف ئەلدەولە شکستی خوارد. تەوزون و عەرەبەکان سامانی سەیف ئەلدەولە و براکەیان تالان کرد. سەیف ئەلدەولە و ناسرئەلدەولە لەگەڵ موتەقی بەرەو موسڵ بەرێکەوتن.

هاوەڵانی تەوزون لەبەغداد شۆڕشیان کرد و ئەو ناچار بۆ بەغداد گەڕایەوە. سەیف ئەلدەولەیش بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕایەوە و لەمانگی شەعبان/ مارس لەحەربی ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و دووبارە سەیف شکستی خوارد و تەوزون شوێنی کەوت.

کاتێك سەیف ئەلدەولە گەیشتە موسڵ، ئەو و براکەی ناسرئەلدەولە لەگەڵ خەلیفە موتەقی و کەسانی دیکە، بەرەو نەسیبین بەرێکەوتن. تەوزون ڕۆشتە ناو موسڵ و موتەقی رێگەی ڕەققەی گرتەبەر و سەیف ئەلدەولە پەیوەستی بوو. موتەقی پەیامی بۆ تەوزون نارد کە لەپەیوەندی ئەو لەگەڵ بورەیدی و هاوپەیمانی لەگەڵ ئەو نیگەرانە و ئەگەر خوازیاری رەزامەندی خەلیفەیە دەبێت لەگەڵ سەیف ئەلدەولە و ناسرئەلدەولە رێگەی ئاشتی بگرێتەبەر تا ئەو (خەلیفە) بۆ بەغداد بگەڕێتەوە. باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی باوکی موسای هاشمی لەمبارەوە لەموسڵەوە بۆ لای تەوزون هاتوچۆی دەکرد تا ئەم ئاشتییە سەقامگیر بوو و ناسرئەلدەولە بۆ سنوورەکانی ژێر دەستی بەڵێنیدا بۆ ماوەی سێ ساڵ، ساڵانە سێ هەزار و شەشسەد هەزار درهەم بدات. تەوزون بۆ بەغداد گەڕایەوە و موتەقی لەموسڵ لای منداڵەکانی حەمدان مایەوە. دواتر هەموویان ڕوویان کردە ڕەققە و لەوێ نیشتەجێ بوون.

## گەیشتنی مۆعیزنەلدەولە بۆ واست و دیالە و گەڕانەوەی ئەو

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە باوکی حسەین کوڕی بویە ئاگادار بوویەوە کەتەوزون بەرەو موسڵ دەڕوات و لەسەر بنەمای ئەو بەڵێنەی لەگەڵ هاوەڵانی بورەیدی دایناوە، بەرەو واست بەرێکەوتووە. ئەوان بەڵێنیان دانابوو بەهێزی دەریایی هاوکاری بکەن بەڵام بەڵێنەکەی خۆیان نەبردەسەر.

تەوزون لەموسڵەوە بەرەو بەغداد بەرێکەوت و لەوێ بۆ جەنگی مۆعێزئەلدەولە ئەسپی غاردا و لەحەڤدەی زیقەعدە/ دوانزەی جولای دوو سوپا لەقیبابی حومەید دەستیان بۆ شمشێر برد. جەنگی نێوان ئەوان دە و چەند رۆژ درێژەی (سیانزە رۆژ) کێشا و سوپاکەی تەوزون پاشەکشێیان دەکرد و دەیلەمییەکان پێشڕەوی تا ئەوەی تەوزون لەرووباری دیالە پەڕییەوە و لەوێ مایەوە و رێگەی نەدا دەیلەمییەکان لەرووبار بپەڕنەوە.

جارێکی دیکە لەرووباری دیجلە رووبەرووی یەکبوونەوە. سوپای تەوزون دەیویست دەیلەمییەکان ناکاوگیر بکات. کوڕی بویە بەباشی زانی لەدیالە دوور بکەوێتەوە بۆ ئەوەی لەوێ گرفتار نەبێت و ئاوی لەژێر فەرماندا بێت. تەوزون هەستی بەمەبەستەکەی کرد و دەستەیەك لەسوپاکەی ڕەوانە کرد. ئەوان لەدیالە پەڕینەوە و بۆسەیان دانا. کاتێك مۆعێزئەلدەولە لەڕۆشتن بەردەوام بوو و سوپاکەی لەدوای خۆی، لەناکاو ئەوانەی بۆسەیان دانابوو، هاتنەدەر و لەنێوان ئەو و سوپاکەی جیاییان دروست کرد و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی مۆعیزئەلدەولە لەکاتێکدا ئامادە نەبوون.

تەوزون دەنگی سوپاییەکانی خۆی بیست و بەخێرایی ئەسپی غاردا و دەستەیەك لەسوپاکەی بەمەلە کردن لەرووبار پەڕینەوە و خۆیان گەیاندە سوپاکەی کوڕی بویە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و ئەسیر کردن. پاشماوەکان ریسوا کران و کوڕی بویە و وزەیرەکەی، سەیمەری لەچواری زیحەججە/ نۆی سێپتامبەر بەرەو شوش هەڵاتن و ئەو سوپاییانەی بێ زیان رزگاریان ببوو، پەیوەستیان بوون. چواردە سەرکردەی ئەوان ئەسیر کرا کەکوڕی داعی عەلەوی

لەناویاندا دەبینرا. ژمارەیەکی زۆر لەدەیلەمییەکان داوای ئەمانیان لەتەوزون کرد. لەم کاتەدا نەخۆشی پەرکەم (قێ) دووبارە یەخەی تەوزونی گرت و بەنەخۆشییەکەیەوە سەرقاڵ بوو. دەستی لەشوێنکەوتنی مۆعیزئەلدەولە هەڵگرت و بەرەو بەغداد گەڕایەوە.

## کوژرانی باوکی یوسفی بورەیدی

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە بورەیدی، باوکی یوسفی برای کوشت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو باوکی عەبدوللەی بورەیدی هەموو سامانەکەی خۆی، بۆ جەنگی مناڵەکانی حەمدان کە لەو کاتەدا گەیشتبوونە واست و هەروەها بۆ جەنگی تەوزون خەرج کردبوو. کاتێك سوپاکەی هەستیان بەکەمی سامانی ئەو کرد، خوازیار پەیوەست بوون بەبراکەی (باوکی یوسف) بوون (چوونکە سامانی زۆری لەبەردەستا بوو). باوکی عەبدوللە لەباوکی یوسفی برای قەرزی وەردەگرت و باوکی یوسف هەرجار کەمێکی پێدەدا و زمانی بۆ سەرکۆنە کردنی دەکردەوە و ئاماژەی بەخراپەکاری و شێت بوون و بیرنەکردنەوەی بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکان دەدا. باوکی عەبدوللە گوێی لەوتەکانی دەگرت. دواتر باوکی عەبدوللە دڵنیا بوو لەوەی براکەی دەیەوێت بیگرێت و قۆڵبەستی بکات و خۆی بەتەنیایی جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست. هەردووك لەیەك دەترسان.

لەم کاتەدا باوکی عەبدوللە گەوهەرێکی گرانبایی بۆ لای براکەی نارد کەبەجکەم لەکاتی بەستنی پەیوەندی هاوسەرگیری کچەکەی لەگەڵ بورەیدی، پیشکەشی کچەکەی خۆی کردبوو. بەجکەم ئەو گەوهەرەی لەکۆشکی خەلیفە هەڵگرت و باوکی عەبدوللە لەسەرەتای پەیوەندیی ژن و مێردایەتی خۆی، گەوهەرەکەی لەکچەکەی بەجکەم سەند. کاتێك پەیك گەیشتە لای باوکی یوسف و لەپەیامەکەی باوکی عەبدوللە ئاگاداری کردەوە و گەوهەرەکەی پێدا، باوکی یوسف گەوهەرناسەکانی کۆکردەوە تا بەهای گەوهەرەکە بخەمڵێنن و چوونکە ئەوان لەدیاریکردنی بەهای گەوهەرەکە زێدەڕۆییان کرد، توڕە بوو و بەهاکەی بەرادەیەك کەم کردەوە تا گەیشتە پەنجا هەزار درهەم و دووبارە سەرکۆنە کردنی

براکەی دەستپێکردەوە و کەم و کورپییەکانی ئەوی هێنایە سەرزمان و بەهەمان پەیك، پەنجا هەزار درهەمی بۆ ڕەوانە کرد. کاتێك پەیك گەیشتە لای باوکی عەبدوللە، لەوەی روویدابوو، ئاگاداری کردەوە. فەرمێسك لەچاوی باوکی عەبدوللە هاتەخوار و وتی: ئایا پێت نەوت شێتی و هەژاری من ئەو پێگە بەرزەی پێبەخشیت و هاوشێوەی قارون دەوڵەمەندی کردیت، دواتر ئاماژەی بەچاکییەکانی خۆی لەگەڵ باوکی یوسفدا.

چەند ڕۆژ دواتر، باوکی عەبدوللە، کۆیلەکانی خۆی لەرێگەی مەسقەف، لەنێوان رووبار و ماڵەکەی ئەو جێگیر کرد. کاتێك براکەی، باوکی یوسف، لەرووبار دەگەڕایەوە و گەیشتە سەر ئەم رێگەیە، کۆیلەکان هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. ئەو بەردەوام هاواری دەکرد: براگیان، براگیان، منیان کوشت. براکەی کەدەنگی هاوارەکانی دەبیست، وتی: بەجەهەننەم. برای ئەم دوانە باوکی حسەین لەماڵەکەی خۆی کەلای ماڵی باوکی عەبدوللە بوو، بەپەلە هاتەدەر و بەدەم پاڕانەوە وتی: برا! ئەوت کوشت و جوێنبارانی کرد. باوکی عەبدوللە بێدەنگی هەڵبژارد. کاتێك باوکی یوسف کوژرا، بەخاکی سپارد. سوپا لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە و شۆڕشی کرد چوونکە گومانیان دەکرد باوکی یوسف زیندووە. باوکی عەبدوللە فەرمانیدا گۆڕەکەی هەڵبدەنەوە و جەنازەکەی لەسەر رێگە فرێبدەن. کاتێك سوپاییەکان جەنازەی ئەویان بینی، هێور بوونەوە و باوکی عەبدوللە فەرمانیدا دووبارە بەخاکی بسپێرن. باوکی عەبدوللە پۆشتە ما باوکی یوسفی برای و هەموو سامانەکانی فڕاند. گەوهەرەکەیش لەناو کاڵاکاندا دەبینرا. ئەو شتێکی زۆری لەسامانی براکەی بەدەست نەهێنا چوونکە براکە پێشتر زۆربەی خەرج کردبوو و زۆربەی بەدەستی خەڵکان پرژ و بڵاو بوویەوە. کەواتە هەم سامانەکەی لەدەستدا هەم گیانی براکەی.

## مەرگی باوکی عەبدوللەی بورەیدی

لەشەوال/ مەی ئەم ساڵە باوکی عەبدوللەی بورەیدی هەشت مانگ دوای کوشتنی براکەی، بەهۆی تایەکی سووتێنەر مرد. دوای ئەو باوکی حسەینی برای جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست. ئەو بەشێوەیەکی نەشیاو و نەگونجاو مامڵەی لەگەڵ سوپاییەکان دەکرد. سوپاییەکان دژی ئەو ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ویستیان بیکوژن و برازاکەی، باوکی قاسم، کوڕی باوکی عەبدوللە بێننە سەرتەخت بەڵام ئەو بۆ هەجەر هەڵات و داوای هاوکاری لەقەرەمتییەکان کرد و قەرەمتییەکان هاوکارییان کرد. براکانی باوکی تاهیری قەرەمتی، لەگەڵ سوپایەك بەهاورێیەتی ئەو بەرەو بەسرە بەرێکەوتن و بینیان باوکی قاسم پارێزگاریان لێدەکات. ئەو قەرەمتییەکانی لەو کەنارە دوور کردەوە و ئەوان ماوەیەك گەمارۆیان خستەسەر. بەڵام سەرئەنجام بێزار بوون و لەنێوان ئەو و مامەکەی ئاشتییان سەقامگیر کرد و گەڕانەوە. باوکی حسەین، ڕۆشتە ناو بەسرە و سوپای ڕازاندەوە و بەمەبەستی جەنگ لەگەڵ تەوزون ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

لەم کاتەدا یەئنس، کۆیلەی باوکی عەبدوللەی بورەیدی، چاوی تەماحی بڕییە فەرماندەیی و لەگەڵ یەکێك لەسەرکردە دەیلەمییەکان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی فەرماندەیی لەنێوان خۆیان دابەش بکەن و باوکی قاسم دووربخەنەوە. دەیلەمییەکان پەیوەستی ئەو سەرکردەیە بوون. باوکی قاسم بێ ئەوەی لەم کەین و بەینە ئاگادار بێت، یەئنسی بۆ لای ئەوان نارد. کاتێك یەئنس گەیشتە لایان، فەرمانی وەستانیدا. لەم کاتەدا ئەو سەرکردە دەیلەمییە، دەیویست بەتەنیا جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست و فەرمانیدا بەزوبین یەئنس بکوژن. زوبین بەرپشتی کەوت و برینداری کرد. یەئنس هەڵات و خۆی شاردەوە.

دواتر دووبەرەکی و چەند گوتاری و بەربڵاوی لەناو دەیلەمییەکان هاتە ئاراوە و ئەو سەرکردەیش خۆی شاردەوە. ئەویان گرت و لەشارەکە دووریان خستەوە و باوکی قاسم فەرمانیدا یەئنس تیمار و چارەسەر بکەن لەگەڵ ئەوەی دەیزانی ئەو ئەم پیلانەی داڕشتووە. کاتێك برینەکەی چاك بوویەوە، باوکی قاسم دوای چل و چەند ڕۆژ ئەوی گرت و سەد هەزار دیناری لێسەند و دواتر کوشتی. پێگەی باوکی

قاسم بەرز بوویەوە تا ئەوەی –ئاماژەی پێدەدرێت– رووبەرووی چارەنووسی خوایی بوویەوە.

## نامەگۆڕینەوەی موتەقی و تەوزون بەمەبەستی گەڕانەوە

لەم ساڵەدا خەلیقە موتەقی نامەیەکی بۆ تەوزون نووسی و داوای لێکرد بۆ بەغداد بگەڕێتەوە چوونکە دەیبینی مناڵەکانی حەمدان لێی بێزار بوون و حەز بەگەڕانەوەی ئەو دەکەن. لەبەر ئەمە بەناچاری نامەیەکی بۆ تەوزون نووسی و حەسەن کوڕی هارون و باوکی عەبدوللە کوڕی باوکی موسای هاشمی نارد تا لەمبارەوە گفتوگۆ بکەن. تەوزون و کوڕی شێرزاد بەروو کراوەیی و پێداگرتن بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی، پێشوازییان لەو دووانە کرد و ئەو دوانە کارەکانی تەوزونیان پشت راست کردەوە و سوێندیان پێ خوارد تا بۆ موتەقی وەفادار ببێت و لەکاتی سوێند خواردن ژمارەیەکی بەرچاو لەقازییەکان، فەقیهەکان و عەباسییەکان و عەلەوییەکان و دەستەیەك لەخەڵکانی کۆکردەوە وتەوزون سوێندی خوارد بەموتەقی و وەزیرەکەی وەفادار بێت. ئەوان ئەم سوێندەیان نووسی و سەرئەنجامی خەلیفە موتەقی بەوە کۆتایی هات کە لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ٣٣٣/٩٤٤ ئاماژەی پێدەدرێت.

## زاڵبوونی روسەکان لەشاری بەردعە

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەروسییە لەدەریاوە بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوتن و لەرێگەی رووباری کوڕ کە رووبارێکی گەورە بوو، خۆیان گەیاندە بەردعە. جێگری مەرزبان لەبەردعە لەگەڵ دەستەیەك لەدەیلەمییەکان و خۆبەخشەکان کەژمارەیان لەپێنج هەزار کەس زیاتر بوو، هاتنە پێش و رووبەرووی سەربازە روسەکان بوونەوە و هێشتا تاژێرێك لەدەستپێکردنی جەنگەکە تێنەپەڕی، موسوڵمانان شکستیان خوارد و دەیلەمییەکان کوژران و روسەکان تا ناو شارەکە شوێنیان کەوتن. هەرکەس چوارپێی بوو، سواری بوو و هەڵات. روسەکان ڕۆشتنە ناو بەردعە و ئەمانیان بەهەموان بەخشی و چاکەکارییان لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە کرد.

سوپای موسوڵمانان لەهەموو کەنارەکانەوە هێرشیان کردە سەر ئەو شارە و روسەکان شکستیان پێ هێنان. کەس نەیتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. زۆرینەی خەڵك لەشارەکە هاتنەدەر و بەردبارانی روسەکانیان دەکرد و روسەکان رێگەی ئەم کارەیان لێدەگرتن بەلاّم ئەوان دەستیان لەکار و کردەوەکانی خۆیان هەڵنەدەگرت و تەنیا بیرمەندەکان ئەم کارەیان بەکردەوەیەکی بێهۆ دەزانی بەلاّم خەڵکانی گەڕەك و کۆلاّنەکان داری ڕق و تۆڵەیان لەدڵدا چاندبوو. لەم کاتەدا جارچی روس جاریدا خەڵکان دەبێت شارەکە چۆڵ بکەن و بۆ ئەم کارە سێ رۆژ دەرفەتیان هەیە. هەرکەس چوارپێی بوو و دەیتوانی هەڵێت، ماڵئاوایی لەشارەکە کرد بەلاّم زۆرینەیان مانەوە و لەدواین رۆژ، روسەکان دەستیان بۆ شمشێر برد و ژمارەیەکی زۆریان لەخەڵك کوشت و دوای کۆمەڵکوژی، زیاتر لەدەهەزار کەس ئەسیر کران و پاشماوەکانیان لەمزگەوتی گەورەی شارەکە کۆکردەوە. روسەکان پێیان وتن: یا گیانی خۆتان بکڕنەوە، یابینەری مەرگی خۆتان بن. مەسیحییەك نێوەنجیگەری کرد و پێشنیاری کرد هەرکام بیست درهەمی لێ بستێنن و رزگاریان بکەن. جگە لەموسوڵمانە بیرمەندەکان کەس بەم پێشنیارە رازی نەبوو. روسەکان کاتێك بینیان ناتوانن هیچیان لێ بەدەست بێنن، تا دووایین کەسیان کوشت و تەنیا هەلاّتوان رزگاریان بوو. روسەکان سامان و دارایی

دانیشتوانەکەیان تالان کرد و کۆیلەکانیان بۆ خۆیان هەڵگرت. هەر ژنێکی جوانیان بینی، کردیانە ژن و کەنیزی خۆیان.

## ڕۆشتنی مەرزبان بۆ جەنگی روسەکان و سەرکەوتن بەسەر ئەوان

کردەوەی روسەکان لەگەڵ دانیشتوانی بەردعە -وەك ئاماژەی پێدرا- نەشیاو بۆ رازی بوون بوو. بانگی کۆبوونەوەی گشتی بەرز بوویەوە. مەرزبان کوڕی محەممەد خەڵکانی کۆکردەوە تا ئەوەی ژمارەی سوپاکەی گەیشتە سی هەزار کەس. ئەو لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و بەرەبەیان و ئێواریێ هێرشی دەکردە سەر روسەکان تا ئەوەی روسەکان توانای بەرگری کردنیان لەدەستدا و هەموو جارێك تێکشاو دەگەڕانەوە. ڕۆژەکان بەمشێوەیە تێدەپەڕین و روسەکان روویان کردە مەراغە و لەبرسانا دەستیان بەخواردنی میوە کرد و نەخۆشی لەناو ئەواندا بڵاو بوویەوە و ژمارەی مردووەکانیان زیادی کرد.

کاتێك مەرزبان نەیتوانی بەئاسانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت، رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر. بیری کردەوە لەچەند شوێنێك بۆسە بنێتەوە و دواتر لەگەڵ سوپاکەی هێرش بکاتە سەر روسەکان و کەم کەم پاشەکشێ بکات و لەناکاو ئەوانەی لەناو بۆسەکاندان، هێرش بکەنە سەر روسەکان و مەرزبان بگەڕێتەوە و فەرمانی گەڕانەوە بۆ ناو گۆڕەپانی جەنگ بەسوپاکەی بدات. ئەم کارەی کرد و جەنگی لەناو گۆڕەپان هەڵگیرساند. لەگەڵ سوپاکەی کەم کەم پاشەکشێی کرد و روسەکان شوێنیان کەوتن تا ئەوەی لەشوێنی بۆسەکە گوزەریان کرد. سوپاکەی مەرزبان بێ ئەوەی سەیری دواوە بکات، هەڵدەهات.

مەرزبان دەڵێت: فەرمانم بەسوپاکەمدا بگەڕێنەوە بەڵام چوونکە ترس لەروسەکان لەناخیاندا رەگی داکوتابوو، نەگەڕانەوە. دڵنیابووم ئەگەر بارودۆخ بەم شێوەیە بڕواتە پێش، روسەکان ژمارەیەکی زیاترمان لێ دەکوژن و دواتر دەگەڕێنەوە بۆ گیانی ئەو سەربازانەی لەبۆسەکاندا بوون و تا دوایین کەسیان کوشتار دەکەن.

دەڵێت: بەتەنیا گەڕامەوە و براکەم و یەکێك لەهاوەڵانم بەدوامدا هاتن. خۆم بۆ

## زاڵبوونی روسەکان لەشاری بەردعە

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەروسییە لەدەریاوە بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوتن و لەرێگەی رووباری کوڕ کە رووبارێکی گەورە بوو، خۆیان گەیاندە بەردعە. جێگری مەرزبان لەبەردعە لەگەڵ دەستەیەك لەدەیلەمییەکان و خۆبەخشەکان کەژمارەیان لەپێنج هەزار کەس زیاتر بوو، هاتنە پێش و رووبەرووی سەربازە روسەکان بوونەوە و هێشتا تاژێرێك لەدەستپێکردنی جەنگەکە تێنەپەڕی، موسوڵمانان شکستیان خوارد و دەیلەمییەکان کوژران و روسەکان تا ناو شارەکە شوێنیان کەوتن. هەرکەس چوارپێی بوو، سواری بوو و هەڵات. روسەکان ڕۆشتنە ناو بەردعە و ئەمانیان بەهەموان بەخشی و چاکەکارییان لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە کرد.

سوپای موسوڵمانان لەهەموو کەنارەکانەوە هێرشیان کردە سەر ئەو شارە و روسەکان شکستیان پێ هێنان. کەس نەیتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. زۆرینەی خەڵك لەشارەکە هاتنەدەر و بەردبارانی روسەکانیان دەکرد و روسەکان رێگەی ئەم کارەیان لێدەگرتن بەڵام ئەوان دەستیان لەکار و کردەوەکانی خۆیان هەڵنەدەگرت و تەنیا بیرمەندەکان ئەم کارەیان بەکردەوەیەکی بێهۆ دەزانی بەڵام خەڵکانی گەڕەك و کۆڵانەکان داری ڕق و تۆڵەیان لەدڵدا چاندبوو. لەم کاتەدا جارچی روس جاریدا خەڵکان دەبێت شارەکە چۆڵ بکەن و بۆ ئەم کارە سێ رۆژ دەرفەتیان هەیە. هەرکەس چوارپێی بوو و دەیتوانی هەڵێت، ماڵئاوایی لەشارەکە کرد بەڵام زۆرینەیان مانەوە و لەدوایین رۆژ، روسەکان دەستیان بۆ شمشێر برد و ژمارەیەکی زۆریان لەخەڵك کوشت و دوای کۆمەڵکوژی، زیاتر لەدەهەزار کەس ئەسیر کران و پاشماوەکانیان لەمزگەوتی گەورەی شارەکە کۆکردەوە. روسەکان پێیان وتن: یا گیانی خۆتان بکڕنەوە، یابینەری مەرگی خۆتان بن. مەسیحییەك نێوەنجیگەری کرد و پێشنیاری کرد هەرکام بیست درهەمی لێ بستێنن و رزگاریان بکەن. جگە لەموسوڵمانە بیرمەندەکان کەس بەم پێشنیارە رازی نەبوو. روسەکان کاتێك بینیان ناتوانن هیچیان لێ بەدەست بێنن، تا دووایین کەسیان کوشت و تەنیا هەڵاتوان رزگاریان بوو. روسەکان سامان و دارایی

دانیشتوانەکەیان تالآن کرد و کۆیلەکانیان بۆ خۆیان هەڵگرت. هەر ژنێکی جوانیان بینی، کردیانە ژن و کەنیزی خۆیان.

## ڕۆشتنی مەرزبان بۆ جەنگی روسەکان و سەرکەوتن بەسەر ئەوان

کردەوەی روسەکان لەگەڵ دانیشتوانی بەردعە -وەك ئاماژەی پێدرا- نەشیاو بۆ رازی بوون بوو. بانگی کۆبوونەوەی گشتی بەرز بوویەوە. مەرزبان کوڕی محەممەد خەڵکانی کۆکردەوە تا ئەوەی ژمارەی سوپاکەی گەیشتە سی هەزار کەس. ئەو لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و بەرەبەیان و ئێواریَ هێرشی دەکردە سەر روسەکان تا ئەوەی روسەکان توانای بەرگری کردنیان لەدەستدا و هەموو جارێك تێکشاو دەگەڕانەوە. ڕۆژەکان بەمشێوەیە تێدەپەڕین و روسەکان روویان کردە مەراغە و لەبرسانا دەستیان بەخواردنی میوە کرد و نەخۆشی لەناو ئەواندا بلآو بوویەوە و ژمارەی مردووەکانیان زیادی کرد.

کاتێك مەرزبان نەیتوانی بەئاسانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت، ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر. بیری کردەوە لەچەند شوێنێك بۆسە بنێتەوە و دواتر لەگەڵ سوپاکەی هێرش بکاتە سەر روسەکان و کەم کەم پاشەکشێ بکات و لەناکاو ئەوانەی لەناو بۆسەکاندان، هێرش بکەنە سەر روسەکان و مەرزبان بگەڕێتەوە و فەرمانی گەڕانەوە بۆ ناو گۆڕەپانی جەنگ بەسوپاکەی بدات. ئەم کارەی کرد و جەنگی لەناو گۆڕەپان هەڵگیرساند. لەگەڵ سوپاکەی کەم کەم پاشەکشێی کرد و روسەکان شوێنیان کەوتن تا ئەوەی لەشوێنی بۆسەکە گوزەریان کرد. سوپاکەی مەرزبان بێ ئەوەی سەیری دواوە بکات، هەڵدەهات.

مەرزبان دەڵێت: فەرمانم بەسوپاکەمدا بگەڕێنەوە بەلآم چوونکە ترس لەروسەکان لەناخیاندا رەگی داکوتابوو، نەگەڕانەوە. دڵنیابووم ئەگەر بارودۆخ بەم شێوەیە بڕواتە پێش، روسەکان ژمارەیەکی زیاترمان لێ دەکوژن و دواتر دەگەڕێنەوە بۆ گیانی ئەو سەربازانەی لەبۆسەکاندا بوون و تا دواین کەسیان کوشتار دەکەن.

دەڵێت: بەتەنیا گەڕامەوە و براکەم و یەکێك لەهاوەڵانم بەدوامدا هاتن. خۆم بۆ

کوژران ئامادە کردبوو. لەم کاتەدا زۆربەی دەیلەمییەکان شەرم دایگرتن و گەڕانەوە و پێکەوە رووبەرووی روسەکان بووینەوە. نهێنی نێوان خۆم و سەربازەکانی ناو بۆسەکانم هێنایە سەرزمان و ئەوان لەپشتەوە هێرشیان کردە سەر روسەکان. شەرێکی بوێرانەمان دەستپێکرد و ژمارەیەکی زۆرمان لەروسەکان کوشت. سەرکردەکەیان لەناو کوژراوەکاندا دەبینرا. پاشماوەی سوپاکەیان پەنایان بۆ قەڵای شارەکە برد. ئەم شارە بەشەهریستان ناو دەبرا. خواردەمەنی و توێشوی زۆریان لەم شارە پاشەکەوت کردبوو. سامان وئەسیرەکانیان لەگەڵ خۆیان بۆ ئەو شارە گواستبوویەوە. مەرزبان گەمارۆی خستە سەریان و خۆڕاگری کردە پیشە. ئاگادار بوویەوە باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی سەعید کوڕی حەمدان بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوتووە و گەیشتۆتە سەڵماس. ناسرئەلدەولەی ئامۆزای ئەوی ڕەوانە کردبوو تا دەست بەسەر ئازەربایەجاندا بگرێت. کاتێك ئەم هەواڵە بەمەرزبان گەیشت، چەندین دەستەی بۆ درێژەدان بەگەمارۆی سەر روسەکان دانا و خۆی بۆ جەنگی کوڕی حەمدان بەرێکەوت. ئاگری جەنگ هەڵگیرسا بەڵام بەفر باری و سوپاکەی کوڕی حەمدان بڵاوەی لێکرد چوونکە زۆربەی سوپاکەی لەعەرەبەکان پێك دەهاتن. لەم کاتەدا نامەیەکی ناسرئەلدەولە گەیشت کەهەواڵی مەرگی تەوزونی تیا نووسرابوو و نووسیبووی خۆی بەرەو بەغداد بەرێکەوتووە. ناسرئەلدەولە فەرمانی بەباوکی عەبدوللە حسەین کوڕی حەمداندا بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە و باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی حەمدان گەڕایەوە.

سوپاکەی مەرزبان جەنگیان دژی روسەکان درێژە پێدا. لەم کاتەدا کۆلێرا لەناو روسەکان بڵاو بوویەوە و هەرکات کەسێك بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە دەمرد، ئەویان لەگەڵ کەرەستەکانی جەنگی بەخاك دەسپارد. موسوڵمانان دوای گەڕانەوەی روسەکان گۆڕەکانیان هەڵدایەوە وکەرەستەکانی جەنگیان هێنایەدەر. دواتر روسەکان شەوانە قەڵاکەیان بەجێهێشت و سامان و ئەوەی دەیانویست، خستیانە سەرشان و بەرەو رووباری کوڕ بەرێکەوتن و سوار کەشتییەکانیان بوون و ڕۆشتن. سوپاکەی مەرزبان نەیانتوانی شوێنیان کەون و سامانەکەیان تاڵان بکەن. ئەوانیان پشتگوێ خست و خواوەند سەرزەمینە ئیسلامییەکانی لەوان پاك کردەوە.

## شۆڕشی کوڕی ئەشکام دژی نوح

لەم ساڵەدا عەبدولله کوڕی ئەشکام ڕێگەی ناسازگاری کردنی ئەمیر نوحی گرتەبەر و لەخوارەزم ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. بۆ ئەم مەبەستە نوح لەبوخاراوە بەرەو مەرو بەرێکەوت و سوپایەکی ڕەوانە کرد. ئیبراهیم کوڕی بارسی وەك فەرماندەی ئەم سوپایە هەڵبژارد. ئەم سوپایە بۆ جەنگی ئەشکام ڕێگەی دەبڕی کەئیبراهیم لەرێگەدا مرد. کوڕی ئەشکام نامەی بۆ فەرمانڕەوای تورکستان نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. فەرمانڕەوای تورکستان منداڵێکی لای نوح لەبوخارا زیندانی بوو. نوح نامەیەکی بۆ باوکی نووسی ئەگەر کوڕی ئەشکام بگرێت، کوڕەکەی رزگار دەکات. فەرمانڕەوای تورکستان رازی بوو. کاتێك کوڕی ئەشکام لەم پیلانە ئاگادار بوویەوە، دووبارە ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نوح نیشاندا و لەخوارەزمەوە بەرەو بارەگای نوح بەرێکەوت. نوح رێزی گرت و لەگوناحەکەی خۆش بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەرەمەزان/ ئاوریلی ئەم ساڵە باوکی تاهیری هەجەری (قەرەمتی) پێشوای قەرەمتییەکان، گرفتاری ئاوڵە بوو و مرد. ئەو سێ برای بوو: باوکی قاسم سەعید کوڕی حەسەن کەگەورەترین برای ئەو بوو و باوکی عەباس فەزڵ کوڕی حەسەن. ئەم دوانە هەردووك هاوڕا و هاوئەندێشەی باوکی تاهیر بوون. ئەم دوانە برایەکی دیکەیان بوو لەگەڵ ئەوان یەکی نەدەگرت و بەردەوام سەرقاڵی خواردنەوە و شەهوەت پەرەستی بوو.

لەجومادی الاوەل/ ژانویەی ئەم ساڵە گرانییەکی ئەوتۆ لەبەغداد هاتە ئاراوە کە یەك قەفیز ئارد بەشەست و چەند درهەم فرۆشرا. سێ رەتڵ نانی وشك بەیەك درهەم، بارانێکی ئەوتۆ باری کەماڵەکانی وێران کرد و ژمارەیەك لەژێر داروپەردووی وێرانییەکان مردن. بەهای زەوی بەرادەیەك کەمی کرد کەئەوەی

بەهاکەی یەك دینار بوو بەکەمتر لەیەك درهەم دەفرۆشرا. ئەوەی وێران دەبوو، نۆژەنیان نەدەکردەوە و ژمارەیەکی زۆر لەگەرماوەکان و بازارەکان لەبەر کەم بوونی خەڵکان پشتگوێ خران و بەهۆی کەم دروست کردنی خانوبەرە، ژمارەیەکی زۆر لەکارگەکانی خشت لێدان چۆڵ کران و ئەگەر کەسێك بەناچاری دەبوا شوێنێك نۆژەن بکاتەوە، خشتە کۆنەکانی بەکار دەبرد. دزی و تالآن کردنی ماڵەکان زیادی کرد و دزەکان شەو و رۆژ سەرقاڵی برینی ماڵی خەڵکان بوون. دزەکان شوێنکەوتە و هاوەلآنی کوڕی حەمدی بوون. کاتێك دزی شەوانەرۆژی هاوەلآنی کوڕی حەمدی زیادی کرد، خەڵکان خۆیان پاسەوانی و کێشکیان دەگرت و بەشەیپور داوای هاوکاریان لەیەك دەکرد. پێگەی کوڕی حەمدی بەرز بوویەوە و خەڵکان نەیاندەتوانی رووبەرووی کارەکانی ببنەوە. کوڕی شێرزاد ئەمان و خەلآتی پێبەخشی و پەیمانی لێسەند کەمانگانە پانزە هەزار دینار لەوەی خۆی و هاوەلآنی دەیدزن، بەو بدات. کوڕی شێرزاد رۆژانە بەشی خۆی لەکوڕی حەمدی وەردەگرت. بەلآی ئەو بەرادەیەك گەورە بوو کەهاوشێوەی نەبینراوە. لەم کاتەدا باوکی عەباسی دەیلەمی فەرماندەی پاسەوانەکانی بەغداد، کوڕی حەمدی گرت و لەجومادی الاخره/ ژانویە ئەوی کوشت و بەم شێوەی گرفتاری خەڵکان تا رادەیەك کەمی کرد.

لەشەعبان/ مارسی ئەم ساڵە کەبەرابەر بوو لەگەڵ مانگی نیسان، لەهەوا شتێکی گەورە دەرکەوت کە لەبەغداد روخساری خۆری داپۆشی. خەڵکان بەکوللە لەقەڵەمیاندا تا ئەوەی یەکیان کەوتە سەرزەوی. باڵندەیەك بوو بەدوو باڵی قنج و راست و نەخشدار کە لەناو باخ و بێستانەکان دەفڕی و هەرکات مرۆڤ باڵەکانی بەدەست دەگرت، نەخشەکەی لەسەر دەستی دەمایەوە و باڵەکەی هەڵدەکەنرا. مناڵەکان بە(طحان الذريره) ناویان دەبرد.

لەم ساڵەدا مۆعێزئەلدولە دەستی بەسەر واستدا گرت و سوپاکەی بورەیدی رێگەی بەسرەیان گرتەبەر.

لەم ساڵەدا سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان، محەممەد کوڕی یەنالی تەرجومانی لەڕەققە گرت و کوشتی چوونکە ئاگادار بوویەوە لەگەڵ موتەقی یەکیان گرتووە

بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر سەیف ئەلدەولە.

لەم ساڵەدا تەوزون لەبەغداد کەخوانێکی گشتی ڕێکخستبوو، لەبەرچاوی هەموان لەهۆش چوو و شێرزاد بەشتێك روخساری داپۆشی تا کەس نەیبینێت. ئەو مۆڵەتی ڕۆشتنی بەخەڵکاندا و وتی: ئەمە نیشانەی خوماری ئەوە.

لەم ساڵەدا نافیع کۆیلەی یوسف کوڕی وەجیە، فەرمانڕەوای عەمان، دژی سەروەری خۆی ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستی بەسەر عەماندا گرت.

لەرەبیع الاوەل/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، رۆمییەکان هاتنە ناو رەئس عەین و سێ ڕۆژ مانەوە و سامانەکانیان فڕاند و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانەکەیان ئەسیر کرد. عەرەبەکان هێرشیان کردنەسەر و ئاگری جەنگیان هەڵگیرساند. رۆمییەکان کەسوپاکەیان لەهەشتا هەزار کەس پێکدەهات و دوموستوق فەرماندەی ئەوان بوو، رەئس عەینیان چۆڵ کرد.

لەرەبیع الاوەل/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان، ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەلی کوڕی موقاتیلی وەك کارگوزاری ڕێگەی فورات، دیاری موزێر، فەرماندەی سوپای قێنسرین، پایتەختەکان و حیمس دەستنیشان و لەگەڵ ژمارەیەك لەسەرکردەکان بەرەو ئەو سنورە، ڕەوانەی کرد بەڵام دوای ئەو لەرەجەب/ فەوریەی ئەم ساڵە کوڕە مامەکەی باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی سەعید کوڕی حەمدانی بۆ ئەم کارە راسپارد. کاتێك باوکی عەبدوللە گەیشتە ڕەققە، دانیشتوانی ئەم شارە ڕێگەیان نەدا بڕواتە ناو شارەکە. ئەو رووبەروویان بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بەشێك لەشارەکەی سووتاند و گەورەکانی شارەکەی گرت و ئەوانی لەگەڵ خۆی بۆ حەلەب برد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و سێی کۆچی ( ٩٤٤ کۆچی )

## ڕۆشتنی موتەقی بۆ بەغداد و لەسەرکار لابردنی ئەو

خەلیفە موتەقی نامەیەکی بۆ ئەخشید محەممەد کوڕی توغجی فەرمانڕەوای میسر نووسی و سکاڵای لەبارودۆخی خۆی کرد و فەرمانی هاتن بۆ بارەگای خۆی پێدا. ئەو لەمیسرەوە بەڕێکەوت و کاتێك گەیشتە حەلەب، باوکی عەبدوڵلە سەعید کوڕی حەمدان کەکوڕی موقاتیل هاوڕێیەتی دەکرد، لەوێ ڕۆشت. کاتێك کوڕی موقاتیل بینی باوکی عەبدوڵلە ڕۆشتووە، خۆی شاردەوە و کاتێك ئەخشید گەیشتە ئەو دیارە، خۆی ئاشکرا کرد. ئەخشید ڕێزی گرت و وەك لێپرسراوی کۆکردنەوەی باجی میسر دەستنیشانی کرد و پاشماوەی ئەو باجەی ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان دەیویست لێی بستێنێت، بەو بەخشی کەبڕەکەی پەنجا هەزار دینار بوو.

ئەخشید حەلەبی بەجێهێشت و لەنیوەی موحەرەم/ نۆی سێپتامبەر لەڕەققە پەیوەستی موتەقی بوو. موتەقی ڕێزی لێگرت و پێگەی بەرز کردەوە. ئەخشید لای ئەو هاوشێوەی بەندەکان دەوەستا و لەپێش خەلیفەوە هەڵدەهات. هەرکات موتەقی داوای لێدەکرد سوار ئەسپ بێت، تا موتەقی لەئەسپ دانەدەبەزی، سوار ئەسپ نەدەبوو. ئەخشید بۆ موتەقی و باوکی حسەین کوڕی موقلە و کەسانی دەوروبەری ئەوان دیاری گرانبایی هێنابوو. هەوڵیدا موتەقی لەگەڵ ئەو بەرەو میسر و شام بەڕێکەوێت و ئەو لای موتەقی بێت بەڵام موتەقی ڕازی نەبوو. ئەخشید پێشنیاری بەموتەقی کرد لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە و نەگەڕێتەوە بۆ بەغداد و ئەوی لەتەوزون ترساند بەڵام موتەقی گوێی لەم پێشنیارەیش نەگرت و داوای لەکوڕی موقلە کرد لەگەڵ ئەخشید بەرەو میسر بڕوات تا فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینە بگرێتەدەست بەڵام کوڕی موقلە ڕازی نەبوو و ئەویش، خەلیفەی لەتەوزون ترساند.، کوڕی موقلە دوای ئەوە دەڵێت: ئەخشید ئامۆژگاری کردم بەڵام گوێم لێنەگرت.

وەك ئاماژەمان پێدا، موتەقی کەسانێکی بۆ لای تەوزون نارد تا پەیمانی ئاشتی ببەستن. نوێنەرەکانی موتەقی تەوزونیان سوێنددا بۆ ئەوەی بەخەلیفە و وەزیرەکەی وەفادار بێت. کاتێك تەوزون سوێندی خوارد، نوێنەرەکان خەلیفەیان ئاگادار کردەوە. خەڵکانیش هەواڵی سوێند خواردنەکەی تەوزونیان بۆ خەلیفە نووسی. موتەقی لەڕەققە لەرێگەی فوراتەوە لەبیست و شەشی موحەرەم/ بیستی سێپتامبەر بەرەو بەغداد کەوتەرێ و ئەخشید بۆ میسر گەڕایەوە. کاتێك موتەقی گەیشتە هیت، لەوێ مایەوە و کەسی نارد تا دووبارە تەوزون سوێند بدات. تەوزون دووبارە سوێندی خوارد و لەبیستی سەفەر/ چواردەی ئۆکتۆبەر لەرێگەی بەغدادەوە بۆ پێشوازی کردنی خەلیفە بەرێکەوت. لەسەندییە چاوی بەخەلیفە کەوت و لەئەسپەکەی دابەزی و سەری کوڕنوشی دانەواند و وتی: من بەسوێندەکەی خۆم وەفادارم و ملکەچی فەرمانەکانی تۆم بەڵام دواتر سیخوڕی بۆ خەلیفە و وەزیر دانا و ئەوانی لەگەڵ بنەماڵەکانیان لەناو خێوەتەکان جێگە کردەوە. دواتر سۆمای چاوی لەموتەقی سەندەوە وکوێری کرد. کاتێك چاوی موتەقییان دەرهێنا، هاواری کرد و کەسانی دەوروبەر و کۆیلە و کەنیزەکانیش دەنگیان بەرز کردەوە وەك بڵێی جیهان خرۆشا. تەوزون فەرمانیدا تەپڵ لێبدەن بۆ ئەوەی دەنگی کەس نەبیسترێت و بەم شێوەیە دەنگی ئەوان بەهیچ کوێ نەگەیشت. موتەقی کوێر و تەوزون بەیانی ئەو رۆژە بەرەو بەغداد بەرێکەوت لەکاتێکدا خەلیفە و داروودەستەکەی لەژێر فەرمانی ئەودا بوون.

خەلافەتی موتەقی سێ ساڵ و پێنج مانگ و هەژدە رۆژ درێژەی کێشا. ئەو روخساری سپی و چاوەکانی شەهلا و دایکی، دایکی منداڵ بوو بەناوی خەلوب. وەزارەتی کوڕی موقلەیش یەك ساڵ و پێنج مانگ درێژەی کێشا.

## خەلافەتی موستەکفی باللە

ئەو موستەکفی باللە باوکی قاسم عەبدوللە کوڕی موکتەفی باللە عەلی کوڕی موعتەزید باللە باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی باوکی ئەحمەد موەفەق کوڕی متوەکیل عەلی اللە یە کە لەگەڵ موتەقی باللە دوای چەندین پشت لەموعتەزید بەیەك دەگەنەوە. کاتێك تەوزون موتەقی قۆڵبەست کرد، موستەکفی بۆ بارەگاکەی خۆی لەسندییە بانگ کرد و لەگەڵ خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

چۆنیەتی بەیعەت لەگەڵ ئەو، باوکی عەباسی تەمیمی رازی کە لەکەسە تایبەتییەکانی تەوزون بوو، بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە: من هۆکار و سەرچاوەی بەیعەت لەگەڵ موستەکفی بووم و چۆنیەتییەکەی بەم شێوەیە: ئیبراهیم کوڕی زوبینداری دەیلەمی منی بۆ لای خۆی بانگ کرد و ڕۆشتمە لای. پێی وتم: کچی لەبنەماڵەیەك خواستووە و ژنی ئەم بنەماڵەیە پێی وتووە: ئێوە دوژمنایەتیان لەگەڵ موتەقی کرد و ئەویش دوژمنایەتی لەگەڵ ئێوە و چیتر دڵی ئەو لەئێوە پاك نابێتەوە. پیاوێك هەیە لەمناڵەکانی خەلیفە موکتەفی و باسی ئاوز و دینداری ئەوی کرد و وتی: ئەو وەك خەلیفەی خۆتان دیاری بکەن چوونکە دەستپەروەردەی ئێوەیە. ئەو سامانێکی زۆر دەخاتە بەردەستی ئێوە کەجگە لەو کەس نازانێت و لەترس و شوێنکەوتنی ئەو لەئەماندا دەبن. ئەو پیاوە وتی: دڵنیام لەوەی ئەم کارە لەسەر دەستی تۆ ئەنجام دەدرێت و لەبەر ئەمە تۆم بۆ ماڵەکەی خۆم بانگ کرد. پێم وت: دەمەوێت دەنگی ئەو ژنە ببیستم. منی بردە لای ژنەکە. ژنێکی بیرمەند و فرەزانم بینی. هەمان گفتوگۆی لەگەڵ من کرد. بەژنەکەم وت: دەبێت ئەو پیاوە ببینم کەباسی دەکەیت. وەڵامی دایەوە: بەیانی بگەڕێرەوە تا پێت بناسێنم. بەیانی ئەو ڕۆژە گەڕامەوە و ئەو پیاوەم بینی کە بەجلی و بەرگی ژنانە لەماڵی کوڕی تاهیر هاتەدەر. خۆی بەمن ناساند و بەڵێنیدا لەگەنجینە (گەنجی شاراوە) هەشتسەد هەزار دینار بێنێتەدەر و سەد هەزار دیناری بەتەوزون بدات و دواتر ڕێگەی بەدەست هێنانی گەنجەکەی نیشاندا. هاوشێوەی پیاوێکی بیرمەند و زانا لەگەڵم ئاخاوت و هەستم بەشیعەگەری ئەو کرد. باوکی عەباسی تەمیمی دەڵێت:

گەڕامەوە بۆ لای تەوزون و ئاگادارم کردەوە. وتەکانم کاریگەری بەجێهێشت و وتی: دەمەوێت ئەو پیاوە ببینم. وتم: دەتوانی بیبینیت بەڵام ڕێگە مەدە کوڕی شێرزاد ئاگادار ببێتەوە. وتی: بەڵێن دەدەم. بۆ لای ئەوان گەڕامەوە و لەبەسەرهاتەکە ئاگادارم کردنەوە و پێم ڕاگەیاندن بەیانی تەوزون بۆ بینینی ئەوان دەڕوات.

لەشەوی یەکشەممە چواردەی سەفەر/ هەشتی ئۆکتۆبەر، من و تەوزون بەشێوەیەکی نهێنی سەردانی ئەو پیاوەمان کرد. تەوزون لەگەڵی ئاخاوت و هەمان شەو پەیمانی لەگەڵ بەست و هەموو شتێك بەنهێنی مایەوە. کاتێك موتەقی گەیشت، بەتەوزونم وت: ئایا لەسەر مەبەستەکەی خۆت سووریت؟ وتی: بەڵێ. وتم: کەواتە هەرئێستا کارەکەت بەئەنجام بگەیێنە چوونکە ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ناو کۆشکەکەی، ناتوانی پێگەی ئەو لەبەر چاو نەگریت. بەم شێوەیە تەوزون کەسی ڕاسپارد و خەلیفە موتەقی کوێر کرد.

ڕۆژی لەسەر کار لابردنی موتەقی، وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ موستەکفی بەست. موتەقییان هێنا و ئەویش بەیعەتی لەگەڵ موستەکفی بەست و خەڵات و داردەستی خەلافەتی تەسلیم کرد. ئەو ژنە وەك ڕاوێژکاری موستەکفی دەستنیشان کرا و خۆی بەعەلەم ناو برد و جڵەوی کارەکانی گرتەدەست.

موستەکفی لەڕۆژی چوارشەممە بیست و چواری سەفەر/ هەژدەی ئۆکتۆبەر باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەلی ساری وەك وەزیر خۆی هەڵبژارد. باوکی فەرەج تەنیا بەناو وەزیر بوو و کوڕی شێرزاد کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد. موتەقی خرایە زیندان وموستەکفی خەڵاتی بەتەوزون بەخشی و تاجی کردە سەر. موستەکفی بۆ گرتنی باوکی قاسم فەزڵ کوڕی موقتەدر هەوڵیدا چوونکە بانگەشەی خەلافەتی خۆی دەکرد و نازناوی مطیع الله ی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. موستەکفی دەیزانی هێشتا چاوی تەماحی بڕیوەتە خەلافەت. باوکی قاسم لەسەردەمی خەلافەتی موستەکفی خۆی شاردەوە و ماڵەکەی ئەو لەکەنار ڕووباری دیجلە کەلای ماڵەکەی کوڕی تاهیر بوو، خاپور کرا و هیچی لێ نەمایەوە.

## شۆڕشی باوکی یەزیدی خارجی لەئەفریقییە

لەم ساڵەدا باوکی یەزید لەئەفریقییە دەرکەوت و ژمارەیەکی بەرچاو لەخەڵکان پەیوەستی بوون. شکستی بەسوپاکان هێنا و بەهەلاّتن ناچاری کردن.

سەرەتای دەرکەوتنی بەم شێوەیە: ئەو زادەی زەناتە و باوکی کەنداد لەشاری توزەر لای قەستیلییە بوو کە بۆ بازرگانی هاموشۆی شارەکانی سودانی دەکرد. باوکی یەزید لەیەکێك لەکەنیزەکانی ئەو بەناوی هەواریە چاوی بەدنیا هەڵهێنا. کەنداد ژن و مناڵەکەی خۆی هێنایە توزەر و باوکی یەزید لەوێ گەشەی کرد و قورئانی خوێند و لەگەڵ دەستەیەك لەنەکارییە تێکەڵ بوو و شوێن ئایینەکەیان کەوت. دواتر رێگەی تاهەرتی گرتەبەر و لەوێ مایەوە و وانەی فێری مناڵان دەکرد تا ئەوەی باوکی عەبدوللەی شیعی (بانگەوازکەری عەلەوییەکان) بۆ بانگەواز کردن بۆ مەهدی بەرەو سجلماسە بەرێکەوت و باوکی یەزید رێگەی تقیوسی گرتەبەر و کێڵگەیەکی بۆ خۆی کڕی و پیشەی مامۆستای هەڵبژارد.

بەپێی باوەڕی ئەو و (باوەری نەکارییە) موسوڵمانەکانی دیکە بەکافر لەقەڵەم دەدران و گیان و ماڵ و سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خەلیفە بۆ ئەوان ڕەوا بوو. ئەو کاری خۆی بەمۆجیاری کردنی خەڵکان لەکردەوە و هەڵس و کەوتیان دەست پێکرد. دەستەیەك شوێنی کەوتن و بەکەسێکی رێزداریان لەقەڵەمدا. ئەمە لەرۆژگاری مەهدی و ساڵی ٩٢٨/٣١٦ زایینی روویدا. باوکی یەزید مایەوە و پێگەی بەرز بوویەوە و لەرۆژگاری قائیم کوڕی مەهدی، شوێنکەوتەکانی فراوان بوون. هێرش کردنی لەناکاوی دەست پێکرد و سوتاندن و بەفیرۆدانی کردە پیشە و تا سنوورەکانی قائیم هێرشی برد. گەمارۆی خستە سەر باغایە و سوپایەکی گەورەی لەو ناوچەیە تێکشکاند. دواتر لەساڵی ٩٤٤/٣٣٣ زایینی گەمارۆی خستە سەر قەستیلیە و دەستی بەسەر تەبسە و مەجانەدا گرت و دیوارەکانی خاپور و ئەمانی بەدانیشتوانەکەی بەخشی و رۆشتە ناو مەرمەجنە.، پیاوێك لەدانیشتوانی شارەکە پێشوازی لێکرد و گوێدرێژێکی ڕەش و سپی و جوان روخساری (!) پێشکەش کرد. باوکی یەزید لەو رۆژە بەدواوە سوار ئەو گوێ درێژە دەبوو. ئەو

پیاوێکی کورتەبالآ، شەل و ناحەز بوو، جل و بەرگی پەشمینی دەپۆشی. ئەو شکستی بەکەتامە (هۆزی شوێنکەوتە و لایەنگیری مەهدی و قائیمی) هێنا و دەستەیەك لەسوپاکەی بەرەو سەبیبە ڕەوانە کرد. دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت و فەرمانڕەواکەی چوارمێخە کێشا و لەوێوە ڕێگەی ئەربەسی گرتەبەر و ئەو شارەیشی خستە ژێر فەرمانی خۆی و دواتر سووتاندی و تالآنی کرد. خەڵك پەنایان بۆ مزگەوتی گەورەی شارەکە برد. باوکی یەزید لەناو مزگەوتەکە خەڵکانی کوشتار کرد و کەسی بەزیندووی نەهێشتەوە. کاتێك ئەم هەواڵە بەخەڵکانی مەهدییە گەیشت، بەناخۆشیان زانی و بەقائیمیان وت: ئەربەس دەروازەی ئەفریقییەیە و ئەگەر دەستی بەسەردا بگیرێت، فەرمانڕەوایی منالەکانی ئەغلەب لەناو دەچێت. قائیم وتی: باوکی یەزید دەبێتە بگاتە موسەللا و ئەمە کۆتایی شۆرشەکەی ئەوە.

دواتر قائیم سوپای بەرێخست تا بارودۆخی وڵاتەکەی سەقامگیر بکات. سوپایەکی بۆ ڕەقادە نارد و سوپایەکی بۆ قیروان و هەموو هێز و توانای خۆی کۆکردەوە. باوکی یەزید ترسا و وێران کردنی شارەکانی ئەفریقییە و تالآن کردن و کوشتنی دانیشتوانی شارەکانی دەستپێکرد. قائیم بەشێکی سوپاکەی بەفەرماندەیی مەیسوری بەهادور و بەشێکی بەفەرماندەیی بوشرای بەهادور بەرەو باجە ڕەوانە کرد. کاتێك باوکی یەزید لەبەرێکەوتنی بوشرا ئاگادار بوویەوە، باروبنەی خست و بەخێرایی بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. هەردوو سوپا لەباجە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سوپاکەی باوکی یەزید شکستی خوارد و باوکی یەزید تەنیا چوارسەد جەنگاوەری لەگەڵ مایەوە. پێی وتن: با پێکەوە تا خێوەتەکانی ئەوان شمشێر بوەشێنین. ئەو کارەیان کرد و بوشرا ڕووبەڕووی شکست بوویەوە و تا تونس پاشەکشێیان کرد. ژمارەیەکی زۆر لەسوپای کەتامە و کەسانی دیکەی ناو سوپاکەی بوشرا کوژران و باوکی یەزید ڕۆشتە ناو باجە و سوتاندی و تالآنی کرد. ئەو منالەکانی دەکوشت و ژنەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد و نامەی بۆ هەموو هۆزەکان نووسی و پێشنیاری پەیوەست بوون بەخۆی پێکردن و هەموان پەیوەستی بوون. باوکی یەزید بۆ سوپاکەی خێوەت و پەناگە و کەرەستەی

جەنگی ئامادە کرد.

کاتێك بوشرا گەیشتە تونس، خەڵکانی کۆکردەوە و پارەی پێدان و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەوانی ئامادە کرد و بۆ جەنگی باوکی یەزید ڕەوانەی کردن. باوکی یەزید سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد. هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و سوپاکەی باوکی یەزید شکستیان خوارد و هاوەڵانی بوشرا لەگەڵ تالآنییە فراوانەکان بۆ تونس گەڕانەوە. لەم کاتەدا لەتونس شۆڕش سەری هەڵدا و دانیشتوانی ئەم شارە ماڵی فەرمانڕەوای شارەکەیان تالآن کرد و فەرمانڕەوا هەڵات. ئەوان نامەیان بۆ باوکی یەزید نووسی و داوای ئەمانیان کرد. باوکی یەزید ئەمانی پێبەخشین و پیاوێکی بەناوی ڕەحمون وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان کرد. باوکی یەزید خۆی بەرەو فەحسی باوکی ساڵح بەڕێکەوت. خەڵکان لێی دەترسان و بەرەو قیروان بەڕێکەوتن. ژمارەیەکی زۆریش لەترسا پەیوەستی سوپاکەی بوون.

قائیم، فەرمانی بەبوشرادا هەواڵەکان سەبارەت بەباوکی یەزید کۆبکاتەوە. بوشرا بەرەو باوکی یەزید بەڕێکەوت و باوکی یەزید لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە. ئەو دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ جەنگی بوشرا نارد و فەرمانی بەفەرماندەکەیاندا بگرن و بکوژن و لەت لەت بکەن و تالآنی بکەن بۆ ئەوەی دڵی خەڵکان لێوانلێو بێت لەترس. فەرماندە فەرمانەکەی ئەنجامدا و سوپاکەی ڕووبەڕووی سوپای بوشرا بوویەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. سوپاکەی باوکی یەزید شکستی خوارد و چوار هەزار کەس لەسەربازەکانی کوژران و پێنسەد کەسیان ئەسیر کران. بوشرا ئەسیرەکانی بەزنجیر بەست و ڕەوانەی مەهدییەی کردن. خەڵکی گەڕەك و کۆڵانەکانی مەهدییە ئەسیرەکانیان کوشتار کرد.

## زاڵبوونی باوکی یەزید لەقیروان و ڕەقادە

شکستی هاوەڵانی باوکی یەزید توڕەیی ئەوی لێکەوتەوە و هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە و بۆ جەنگی کەتامییەکان بەرێکەوت و گەیشتە جەزیرە. پێشەنگەکانی سوپا ڕووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگیان دەستپێکرد. ئالأدارەکانی کەتامی شکستیان خوارد و هاوەڵە وەحشییەکانی باوکی یەزید تا ڕەقادە شوێنیان کەوتن. باوکی یەزید لەگەڵ سەد هەزار جەنگاوەر لەبەشی ڕۆژئاوای قیروان دابەزی و بەیانی ئەو ڕۆژە لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ڕەقادە ئوردووی لێدا. فەرمانڕەوای ڕەقادە، خەلیل، گرنگی بەباوکی یەزید نەدا و ئەوی بەکەم بەها زانی. خەلیل فەرمانیدا کەس بۆ جەنگ نەرواتەدەر. ئەو چاوەڕوانی هاتنی مەیسور و سوپاکەی بوو. کاتێك باوکی یەزید لەمە ئاگادار بوویەوە، دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ ناو شارەکە نارد و شەڕێکی مەترسیداری خستەگەر و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی شارەکە کوژران و ئەوانی دیکە هەڵاتن بەڵام خەلیل لەگەڵ ئەوان نەڕۆشت. خەڵکان بانگیان دەکرد و ئەو بەنارەزامەندییەوە لەدەروازەی تونسەوە بەرێکەوت. باوکی یەزید هێرشی کردە سەر خەلیل و ئەو، بێ جەنگ هەڵات و ڕۆشتە ماڵەکەی خۆی و دەرگاکەی بەست و چاوەڕوانی سوپاکەی مەیسوری دەکرد. هاوەڵانیشی ئەو کارەیان کرد. سوپا وەحشییەکەی باوکی یەزید ڕۆشتنە ناو شارەکە و کوشتیان و خراپەیان کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی شارەکە جەنگان.

باوکی یەزید یەکێك لەهاوەڵەکانی خۆی بەناوی ئەیوبی زوەیلی لەگەڵ سوپایەك بۆ قیروان نارد و ئەو، لەکۆتاییەکانی سەفەر/ ئۆکتۆبەر ڕۆشتە شارەکە و هەرکەسێکی لەناو شارەکەدا بینی، کوشتی و سامانەکانی فڕاند و خەلیلی لەناو ماڵەکەی خۆیدا گەمارۆدا. خەلیل و هاورێکانی داوای ئەمانیان کرد. خەلیلیان بردە لای باوکی یەزید و ئەو کوشتی. پیرەکانی قیروان بۆ وەرگرتنی ئەمان ڕۆشتنە لای باوکی یەزید لەرەقادە و سڵاویان بۆ نارد. باوکی یەزید لەبەخشینی ئەمان خۆی دوادەخست و سوپاکەی لەکوشتار بەردەوام بوون. پیرەکان دووبارە

سکالاّیان بەرز کردەوە و وتیان: شارەکە وێران کراوە. باوکی یەزید وتی: ترسم نییە. مەککە و بەیت ئەلموقەدەسیش وێران بىن. دواتر ئەمانی پێبەخشین بەلاّم دەستەیەك لەسوپا وەحشییەکەی لەتالاّن و کوشت و بڕ بەردەوام بوون. لەناکاو ئاگادار بوونەوە کەمەیسور لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەرێگەدایە. لەم کاتەدا وەحشییەکان لەترسا شارەکەیان بەجێهێشت.

مەیسور لەقیروان نزیك بوویەوە. هەواڵیان بەقائیمدا بوو دەستەیەك لەمناڵەکانی کەملان نامەیان بۆ باوکی یەزید نووسیوە کەبەسەر مەیسوردا سەرکەوتنی پێدەبەخشن. قائیم ئەم هەواڵەی بەمەیسور گەیاند و ئەوی ئاگادار کردەوە و فەرمانی دوورخستنەوەی ئەم دەستەی پێدا. ئەوان رۆشتنە لای باوکی یەزید و وتیان: ئەگەر پەلە بکەیت، سەرکەوتن بەدەست دێنیت. باوکی یەزید هەمان رۆژ بەرێکەوت و جەنگ لەنیوان دوو سوپا دەستی پێکرد. باڵی چەپی سوپاکەی باوکی یەزید شکستی خوارد. کاتێك باوکی یەزید ئەمەی بینی، هێرشی کردە سەر مەیسور و سوپاکەی مەیسور هەلاّتن. مەیسور، جڵەوی ئەسپەکەی سوڕاند، ئەسپەکەی خزا و کەوتە خوار. هاوەلاّنی بەرگرییان لێکرد بۆ ئەوەی زیانی بەرنەکەوێت. دواتر ئەو دەستە لەمناڵەکانی کەملان کەمەیسور ئەوانی دوور خستبوویەوە، مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. مەیسور کوژرا و سەریان بردە لای باوکی یەزید و سوپاکەی رووبەرووی شکست بوویەوە. هەواڵی ئەم سەرکەوتنە بۆ هەموو ناوچەکانی ئەفریقییە نووسرا و سەری مەیسوریان لەناو گەڕەك و کۆلاّنەکانی قیروان گەڕاند.

قائیم لەم شکستە ئاگادار بوویەوە. ئەو و دانیشتوانی مەهدییە ترسان و خەڵکی کەنارەکان پەنایان بۆ شارەکە برد. هەموویان کۆبوونەوە و لەناو بورج و دیواری شارەکە سەنگەریان گرت. قائیم رێگەی ئەم کارەی لێگرتن و مژدەی سەرکەوتنی پێدان. بەم شێوەیە سوپاکەی قائیم بۆ زەویلە گەڕانەوە و سەنگەریان گرت. باوکی یەزید دوو مانگ و هەشت رۆژ لەناو خێوەتەکەی مەیسور مایەوە و سوپاییەکانی بۆ ناوچەکانی دیکە رەوانە دەکرد تا تالاّنی کۆبکەنەوە و بگەڕێنەوە.

ئەو دەستەیەکی بۆ سوسە نارد. ئەم سوپایە بەزۆری شمشێر دەستیان بەسەر

شارەکەدا گرت و پیاوەکانیان کوشت و ژنانیان ئەسیر و شارەکەیان سووتاند. نێوان دوو قاچی ژنەکانیان قڵیشاند، سکی ژنانیان دڕی بەشێوەیەك لەئەفریقییە هیچ ماڵێکی ئاوەدان نەمایەوە و هەرکەس رزگاری ببوو، پێ پەتی خۆی گەیاندە قیروان و هەرکەس لەئەسیرەکان رزگاری بوو، لەتینویەتی و برسیەتیدا، مرد.

لەکۆتاییەکانی رەبیع الاخری ٣٣٣/ دێسامبەری ٩٤٤ زایینی قائیم فەرمانیدا بەدەوری مەهدییە خەندەك هەڵکەنن و نامەی بۆ زیری کوڕی مەناد، سەرۆکی سەنهاجە و گەورەکانی کەتامە و هۆزەکان نووسی و هەموانی بۆ هاتن بۆ مەهدییە و جەنگ لەگەڵ سوپای باوکی یەزید هاندا. ئەوان بۆ ڕۆشتن بۆ مەهدییە خۆیان ئامادە کرد.

## گەمارۆ خستنە سەر مەهدییە لەلایەن باوکی یەزید

کاتێك باوکی یەزید بیستی سەنهاجە وکەتامە و کەسانی دیکە بۆ هاوکاری قائیم خۆیان ئامادە دەکەن، ترسا و دەستبەجێ بەرەو مەهدییە بەرێکەوت و لەپانزە میلی ئەو شارە ئوردووی لێدا و دەستە شەڕکەرەکانی خۆی بۆ کەنارەکانی مەهدییە ڕەوانە کرد و ئەوەی دەستی کەوت، تالانی کرد و ئەوەی بنییان، خوێنیان ڕشت. خەڵکان بەگشتی لەمەهدییە کۆبوونەوە. کەتامە و سوپاکەی قائیم کاتێك بیستیان سوپاکەی باوکی یەزید بۆ تالان کردنی ناوچەکان بڵاو بوونەتەوە، بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر ئوردووگاکەی و لەوێ سەرکوتی بکەن. ئەوان رۆژی پێنجشەممە بیست دووی جومادی الاوەل/ دوانزەی ژانویەی ئەم ساڵە بۆ هێرش کردنە سەر ئوردووگای باوکی یەزید بەرێکەوتن.

باوکی یەزید لەم هێرشە ئاگادار بوویەوە. لەم کاتەدا مناڵە گەورەکەی، فەزڵ لەگەڵ سوپایەك لەقیروانەوە گەیشت. باوکی یەزید ئەوانی بۆ جەنگی خەڵکانی کەتامە ڕەوانە کرد و کوڕەکەی خۆی کردە فەرماندەی ئەوان. دوو سوپا لەشەش میلی مەهدییە رووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگ دەستپێکرد و باوکی یەزید ئاگادار بوویەوە. ئەو لەگەڵ هەموو هاوەڵانی خۆی بەرەو مەهدییە بەرێکەوت بەڵام بینی سوپاکەی هەڵاتووە و ژمارەیەکی زۆریان کوژراون. کاتێك خەڵکانی کەتامە،

باوکی یەزیدیان بینی، بێ جەنگ هەڵاتن و باوکی یەزید تا دەروازەی فەتح شوێنیان کەوت. دەستەیەك لەهاوەڵە وەحشییەکانی باوکی یەزید، ڕۆشتنە ناو شارەکە و دەروازەی فەتحیان کردەوە. باوکی یەزید دوای ئەوەی دەستی بەسەر مەهدییەدا گرت، بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە و لەجومادی الاخرە/ ژانویە مەبەستی مەهدییەی کرد و گەیشتە دەروازەی فەتح و هۆزی زەویلەی بۆ لای دەروازەی بەکر ڕەوانە کرد و خۆی هێرشی کردە سەر ئەو خەندەکەی هەڵیان کەندبوو. بینی دەستەیەك لەکۆیلەکان پارێزگاری لێدەکەن. باوکی یەزید لای خەندەکەکە ڕووبەڕوویان بوویەوە. باوکی یەزید و سوپاکەی دەستیان بەسەر ئاوەکەدا گرت و ئەسپەکان تا سینە لەئاودا نوقم بوون تا ئەوەی گەیشتنە لای دیوارێکی تازە دروست کراو. کۆیلەکان هەڵاتن و باوکی یەزید، شوێنیان کەوت.

باوکی یەزید، گەیشتە دەروازەی مەهدییە کەکردبوویانە نوێژگەی جەژن. دووری ئەو لەمەهدییە بەئەندازەی مەودای یەك تیر بوو. سوپاکەی لەهۆزی زەویلە بلاوەیان لێکرد و سەرقاڵی کوشتار و تاڵان کردن بوون و خەڵکان بەگشتی داوای ئەمانیان دەکرد. جەنگ لای دەروازەی فەتح لەنێوان کەتامە و هاوەڵە وەحشییەکانی باوکی یەزید بەقورسی بەردەوام بوو. سوپاکەی باوکی یەزید لەوەی ئەو لەم کەنارە ئەنجامی دەدا، بێ ئاگا بوون. خەڵکانی کەتامە هێرشیان کردە سەر وەحشییەکان و بەهەڵاتن ناچاریان کردن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. باوکی یەزید لەم شکستە و گەیشتنی زیری کوڕی مەناد لەگەڵ هۆزی سەنهاجە ئاگادار بوویەوە و ترسا. لەبەر ئەمە بەناچاری مەبەستی دەروازەی فەتحی کرد تا لەپشتەوە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکاتە سەر زیری و کەتامە. فەرمانیدا تەپڵەکان لێبدەن و ئاڵاکان هەڵکەن. خەڵکی کەنارەکان کاتێك ئەمەیان بینی، گومانیان کرد قائیم لەمەهدییە هاتۆتەدەر، دەنگی تەکبیریان بەرز کردەوە و ورەیان بەرز بوویەوە و پێداگرانەتر درێژەیان بەجەنگدا. باوکی یەزید، سەریسوڕما. خەڵکی ئەوکەنارە ناسیانەوە هێرشیان کردەسەر بۆ ئەوەی بیکوژن. ئاگری جەنگ لای سوپاکەی باوکی یەزید بڵێسەی دەسەند. بەشێك لەسوپاکەی کەلێنێکیان لەدیوارەکەدا دروست کرد و باوکی یەزید بەهۆی ئەو کەلێنانەوە

ڕزگاری بوو و دوای ئاوا بوونی هەتاو، بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە لەکاتێکدا هێشتا سوپاکەی ئەو لەجەنگ دژی کۆیلەکان بەردەوام بوون. کاتێك سوپاکەی باوکی یەزید، باوکی یەزیدیان بینی، ورەیان بەرز بوویەوە و کۆیلەکان بلاوەیان لێکرد و هەلاتن.

باوکی یەزید بەرەو سەرنوتە بەڕێکەوت و خەندەکی بەدەوری سوپاکەی هەڵکەند و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی ئەفریقییە و وەحشییەکان و نەفوسە و زاب و کەنارەکانی مەغریب پەیوەستی بوون و مەهدییە گرفتاری تەنگانەیەکی ئازاردەر و کوشندە بوو. کەس مۆڵەتی ڕۆشتنەدەر و هاتنە ناوەوەی پێ نەدەدرا. باوکی یەزید لەبیست و سێی جومادی الاوەل/ سیانزەی فەوریەی ئەم ساڵە هێرشی کردە سەر مەهدییە و شەڕێکی مەترسیداری دەستی پێکرد و دەستەیەك لەسەرکردەکانی سوپاکەی قائیم کوژران. باوکی یەزید، خۆی هێرشی برد و لەدەروازەکە نزیك کەوتەوە. یەکێك لەکۆیلەکان ئەوی ناسییەوە و جڵەوی ئەسپەکەی گرت و هاواری کرد: ئەمە باوکی یەزیدە، بیکوژن. یەکێك لەهاوەلانی باوکی یەزید گەیشت و دەستی ئەو پیاوەی قرتاند و باوکی یەزیدی ڕزگار کرد.

کاتێك باوکی یەزید، پێداگری و خۆڕاگری سوپاکەی قائیمی بینی، نامەیەکی بۆ کارگوزارەکەی لەقیروان نووسی و فەرمانی پێدا جەنگاوەرانی ئەم شارە بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. کارگوزار سوپاییەکانی ڕەوانە کرد. سەربازەکان گەیشتنە لای باوکی یەزید و ئەو لەکۆتایی ڕەجەب/ حەڤدەی مارس دووبارە هێرشی کردە سەر مەهدییە. ئاگری شەڕێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند و باوکی یەزید ریسوایانە شکستی خوارد و دەستەیەك لەهاوەلانی ئەو و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی قیروان کوژران. باوکی یەزید لەدەیەی کۆتایی شەوال/ دوای پێنجی ژوئەن بۆ چوارەم جار هێرشی کرد و شەڕ دووبارە دەستی پێکردەوە و ئەو بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە. ژمارەیەکی زۆر لەهاوەلانی قائیم لەبەر برسیەتی و گرانی لێی جیابوونەوە. لەم کاتەدا قائیم دەرگای سیلۆکانی خۆراکی کردەوە کەپێشتر مەهدی لەخۆراك لێوانلێوی کردبوو. خواردەمەنییەکانی لەناو خەڵکان دابەش کرد بەلام کەمی خواردن بەئەندازەیەك بوو کەخەڵك چوارپێ و مردووەکانیشیان دەخوارد.

زۆربەی بازارییەکان و بازرگانەکان مەهدییەیان بەجێهێشت و جگە لەسوپاییەکان کەس لەشارەکەدا نەمایەوە. سوپا وەحشییەکەی باوکی یەزید، هەرکەس شارەکەی بەجێدەهێشت، دەیانگرت و بۆ بەدەست هێنانی زێر، سکیان هەڵدەدڕی.

لەم کاتەدا خەڵکانی کەتامە گەیشتن و لەقەستینە ئوردوویان لێدا. باوکی یەزید ترسا و پیاوێك لەسوپاکەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکان لەلای وەرفەجومە و شوێنەکانی دیکە، خەڵکانی کەتامەیان کردە مەبەست و ئامانجی خۆیان و رووبەروویان بوونەوە و بەهەڵاتن ناچاریان کردن. خەڵکانی کەتامە بڵاوەیان لێکرد و وەحشییەکان لەهەموو کەنارەکانەوە بۆ پەیوەست بوون بەباوکی مەهدی بەرێدکەوتن و لەگەڵ ئەو تاڵان و کوشت و بڕیان دەکردە پیشە و دواتر بۆ ماڵەکانی خۆیان دەگەڕانەوە تا ئەوەی ئەفریقییە کەسی تیا نەما و لەبەر ئەوەی هیچ بۆ تاڵان کردن نەمایەوە، چیتر کەس بەرەو ئەو ناوچەیە نەدەڕۆشت و جگە لەخەڵکی ئەوراس و مناڵەکانی کەملان کەس لای باوکی یەزید نەمایەوە.

کاتێك قائیم لەبڵاوە لێکردنی سوپاکەی باوکی یەزید ئاگادار بوویەوە، هێرشی کردەسەر و لەشەشی زیقەعدەی ٣٣٣/ نۆی جولای ٩٤٤ زایینی، ئاگری جەنگ لەنێوان دوو سوپا هەڵگیرسا. رۆژی دواتر، سوپای قائیم رووی کردە گۆڕەپانی جەنگ بەڵام کەس لەسوپاکەی یەزید نەهاتە گۆڕەپانی جەنگ. باوکی یەزید کەسانێکی بەدوای سەربازەکانی ئەوراس ناردبوو. سوپای قائیم دووبارە هێرشیان کردەسەر. ئەو لەخەندەکەکەی هاتەدەر و شەڕێکی قورس دەستیپێکرد. ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی باوکی یەزید و یەکێك لەسەرکردەکانی کوژران. کوژرانی ئەم سەرکردەیە بۆ باوکی یەزید دژوار و بۆ خەندەکەکەی گەڕایەوە و دووبارە جەنگی دەستپێکردەوە. لەم کاتەدا ڕەشەبا هەڵیکرد بەشێوەیەك کەس کەسی نەدەبینی. سوپاکەی قائیم شکستی خوارد و دەستەیەکیان کوژران. باوکی یەزید دووبارە گەمارۆی خستە سەر ئەفریقییە و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی مەهدییە بەرەو دوورگەی سەقەلییە، تەرابلوس، میسر و رۆم هەڵاتن.

لەکۆتاییەکانی زیقەعدە/ پانزەی جولای چەندین دەستەی گەورە پەیوەستی سوپاکەی باوکی یەزید بوون و ئەو بەرەو مەهدییە پێشڕەوی دەست پێکرد.

سەربازەکانی کەتامە دووسەد کەسیان لەناو خۆیان هەڵبژارد. ئەم دووسەد کەسە هاوشێوەی یەك جەستە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی باوکی یەزید و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بەهەمان ژمارەیان ئەسیر کرد. ئەوەندەی نەمابوو دەستیان بەباوکی یەزید بگات بەڵام هاوەڵانی بەرگرییان لێکرد و رزگارییان کرد. دانیشتوانی مەهدییە شادمان بوون و ئەسیرەکانیان بەتەناف بەستەوە و بردیانە ناو شارەکە. ساڵی ٩٤٥/٣٣٤ زایینی دەستیپێکرد و هێشتا باوکی یەزید لەکەنارەکانی مەهدییە بوو.

لەموحرەم/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە پیاوێك لەئەفریقییە دەرکەوت و پێشنیاری بەخەڵکان دەکرد پەیوەستی بن. ژمارەیەکی زۆر بەپێشنیارەکەی رازی بوون و ملکەچی خۆیان بۆ نیشاندا. وای نیشان دەدا لەمناڵەکانی عەباسە و لەبەغدادەوە هاتووە. ئەو ئاڵای ڕەشی عەباسییەکانی (دروشمی عەباسییەکان) پێبوو. یەکێك لەهاوەڵانی باوکی یەزید ئەوی گرت و بردییە لای باوکی یەزید. باوکی یەزید کوشتی و دواتر دەستەیەك لەسوپاکەی باوکی یەزید بەمەبەستی دوژمنایەتی لەگەڵ دەستەیەك کەبوختانیان بۆ هەڵبەستبوون، پەیوەستی سوپای مەهدییە بوون و شان بەشانی سوپاکەی قائیم دژی باوکی یەزید جەنگان و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و سوپای باوکی یەزید بڵاوەی لێکرد و جگە لەهۆزی هەوارە، ئەوراس و مناڵەکانی کەملان کەباوکی یەزید بەکەسانی بڕواپێکراوی خۆی لەقەڵەمی دەدان، کەس لەدەوری نەمایەوە.

## كۆچی باوكی یەزید لەمەهدییە

كاتێك –وەك ئاماژەی پێدرا– سوپاكەی باوكی یەزید بڵاوەی لێكرد، سەركردەكانی كۆبوونەوە و راوێژیان كرد و وتیان: رێگەی قیروان دەگرینەبەر و وەحشییەكانی هەموو كەنارەكانْ كۆدەكەینەوە وبۆ لای باوكی یەزید دەگەڕێینەوە چوونكە ئەگەری هەیە قائیم لەشوێنی ئێمە ئاگادار ببێتەوە و هێرشمان بكاتەسەر. ئەوان سوار ئەسپ بوون و رێگەی قیروانیان گرتەبەر و هیچیان بەباوكی یەزید نەوت و زۆربەی سوپاكەیان لەگەڵ خۆیان برد. باوكی یەزید كەسی بەدوای ئەواندا نارد بۆ ئەوەی بیانگەڕێنێتەوە بەڵام ئەوان رازی نەبوون. باوكی یەزید لەگەڵ سی سوارچاك، بێ ئەوەی باروبنەی خۆی ببات، رێگەی قیروانی گرتەبەر و لەشەشی سەفەر/ بیست و نۆی سێپتامبەر گەیشتە قیروان. جگە لەفەرمانڕەوای قیروان كەس پێشوازی لێنەكرد. منداڵەكان بەدەوری ئەودا گەمە و گاڵتەیان پێدەكرد.

قائیم لەڕۆشتنی ئەو ئاگادار بوویەوە وخەڵكان بۆ تاڵان كردنی باروبنەی ئەو بەرێكەوتن و خۆراك و خێوەتەكانیان بینی و هەڵیان گرت و بژێوی خۆیان دابین كرد. كەمێك لەگوشاری سەرشانیان بەهۆی گەمارۆكەوە كەمی كرد. قائیم بۆ هەموو شارەكان كارگوزارەكانی خۆی نارد و ئەوان كارگوزارەكانی باوكی یەزیدیان لەشارەكان دەرپەڕاند. خەڵكی قیروان كاتێك كەمی سوپاكەی باوكی یەزیدیان بینی، لەقائیم ترسان و ویستیان باوكی یەزید قۆڵبەست بكەن بەڵام شكۆ و گەورەیی ئەو لەناو دڵیاندا جێگیر بوو. ئەوان نامەیان بۆ قائیم نووسی و داوای ئەمانیان كرد بەڵام قائیم وەڵامی نەدانەوە.

باوكی یەزید لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و فەرمانڕەواكەی خۆی بۆ سەرقاڵ بوونی بەخواردن و خواردنەوە سەركۆنە كرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ سوپاكەی بۆ جیهاد بەرێكەوێت. فەرمانڕەوا ئەو كارەی كرد و بەشێوەیەكی نەرم لەگەڵ سوپاییەكان ئاخاوت و ئەوانی لەقائیم ترساند و بۆ جەنگی ئەو ڕەوانەی كردن.

خەڵك ئەم هەواڵەیان دەم بەدەم بیست و سوپاییەكان لەهەموو كەنارەكانەوە

پەیوەستیان بوون. لەلایەکی دیکە خەڵکی بەشێك لەشارەکان و گوندەکان کاتێك لەبلاّو بوونەوەی سوپاکەی باوکی یەزید ئاگادار بوونەوە، کارگوزارەکانی ئەویان گرت و کوشتیان یا ڕەوانەی مەهدییەیان کردن.

دانیشتوانی سوسە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەستەیەك لەسوپاکەی باوکی یەزیدیان گرت و ڕەوانەی بارەگای قائیمیان کرد. قائیم سپاسی خەڵکانی سوسەی کرد و حەوت کەشتی لێوانلێو لەخواردەمەنی بۆ ناردن. کاتێك سوپاکەی باوکی یەزید کۆبوونەوە، ئەوانی بۆ هەموو ناوچەکان نارد و فەرمانی کوشتار و تالاّن کردن و سوتاندن و وێران کردنی پێدان. سوپای باوکی یەزید گەیشتە تونس و لەبیستی سەفەری ٣٣٤/ چواردەی ئۆکتۆبەری ٩٤٤ زایینی بەشمشێری دەرکێشراو ڕۆشتنە ئەو شارە و سامانەکانیان تالاّن کرد و ژن و منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان برد. پیاوەکانیان کوشت و گەیشتنە هەر مزگەوتێك، وێرانیان کرد. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان بۆ رزگاری، خۆیان خستە ناو ئاو، بەلاّم دەریا ئەوانی نغرۆ کرد.

قائیم سوپایەکی بۆ تونس ڕەوانە کرد. سوپاکەی باوکی یەزید ڕووبەڕوویان بونەوە و شەڕێکی بوێرانەیان دەستپێکرد. سوپاکەی قائیم بەریسوایی شکستی خوارد تا ئەوەی شەو جیایی لەنێوان ئەواندا دروست کرد. سوپاکەی قائیم لەکوێستانی رەساس پەنایان گرت و لەوێوە بەرەو ئەستەفورە بەرێکەوتن. سوپای باوکی یەزید شوێنیان کەوتن و خۆیان پێگەیاندن و دووبارە ئاگری شەڕ بڵێسەی سەند. سوپای قائیم خۆڕاگری کرد و سوپای باوکی یەزید شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و لەپێنجی رەبیع الاوەل/ بیست و حەوتی ئۆکتۆبەر خۆیان گەیاندە تونس و دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لەسوپاکەی باوکی یەزید کوشت، ئەوانیان لەشارەکە دەرپەڕاند و خواردەمەنییەکانی ئەوانیان تالاّن کرد.

باوکی یەزید کوڕێکی بوو بەناوی ئەیووب. کاتێك لەم شکستە ئاگادار بوویەوە، کوڕەکەی خۆی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد و لەگەڵ هەلاّتووانی ئەو جەنگە کۆبوویەوە و ڕێگەی تونسی گرتەبەر. ئەوەی بۆ تونس گەڕابوویەوە، کوشتیان و هەرچییان لەو شارە دەستکەوت، سوتاندیان. دواتر ڕووی کردە باجە

و هەرکەس لەسوپاکەی قائیمی بینی، کوشتی و خوێنی ڕشت. بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و سووتاندی. لەو ماوەی لەشارەکە مایەوە، بەرادەیەك خەڵکی کوشت و ئەسیری کرد کەگێڕانەوەی ئەگەری نییە.

دەستەیەك بڕیاری کوشتنی باوکی یەزیدیاندا وکەسیان بۆ لای قائیم نارد. قائیم ئەوانی هاندا و بەڵێنی پێدان. باوکی یەزید لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و ئەو دەستەی لەناو برد. پیاوە وەحشییەکانی باوکی یەزید، بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەر دانیشتوویەکی قیروان و سامان و سێ کچی ئەو پیاوەیان ڕفاند. کاتێك بەیانی بوویەوە و خەڵکان بۆ نوێژی بەیانی کۆبوونەوە، ئەو پیاوە لەوەی بەسەری هاتبوو، ئەوانی ئاگادار کردەوە. خەڵکانیش بوونە هاوڕێی و دەنگی دادخوازیان بەرز کردەوە. ژمارەیەکی زۆر کۆبوونەوە و خۆیان گەیاندە باوکی یەزید و بەشێوەیەکی توند لەگەڵی ئاخاوتن. ئەو داوای لێبووردنی کرد و کچەکانی گەڕاندەوە.

کاتێك خەڵکان بۆ ماڵەکانیان گەڕانەوە، کوژراوێکیان لەسەر ڕێگە بینی. دەوترا فەزڵ کوڕی باوکی یەزید، لەبەر جوانی ژنەکەی ئەوی کوشتووە و ژنەکەی بۆ خۆی هەڵگرتووە. خەڵکان جەنازەکەیان هەڵگرت و بردیانە مزگەوتی گەورەی شارەکە و دەنگیان بەرز کردەوە کە: تەنیا ملکەچی فەرمانەکانی قائیم دەبین و ویستیان هێرش بکەنە سەر باوکی یەزید. هاوەڵانی باوکی یەزید لەدەوری کۆبوونەوە و سەرکۆنەیان کرد و وتیان: تۆ دەروازەیەکت بۆ دوژمنەکەت کردۆتەوە و چیتر ناتوانی بیبەستیت بەتایبەت ئەوەی قائیم لێمان نزیکە. باوکی یەزید قیروانییەکانی کۆکردەوە و سەرکۆنەی کردن و پەیمانیدا چیتر نەکوشتار بکات نەتالانی و نەپەردەی ناموسی کەس بدڕێنێت. لەم کاتەدا ئەسیرەکانی تونسیان هێنا. خەڵکان هێرشیان کرد و ئەسیرەکانیان ئازاد کرد.

لەو کاتەدا قائیم یەکێك لەسەرکردەکانی خۆی بەناوی عەلی کوڕی حەمدون ڕەوانە و فەرمانی پێدابوو سوپایەك ئامادە بکات و هەرکەس لەخەڵکانی مەسیلە کەتوانای هەڵگرتنی کەرەستەی جەنگی هەیە، لەگەڵ خۆی ببات. عەلی لەخەڵکانی مەسیلە و سەتیف و شوێنەکانی دیکە، پیاوەکانی کۆکردەوە و ژمارەی سوپاکەی

زیادی کرد. دەستەیەك لەمناڵەکانی هەراس پەیوەستی بوون. ئەو رێگەی مەهدییەی گرتەبەر. ئەیووب کوڕی باوکی یەزید بێ ئەوەی بزانێت فەرماندەی ئەم سوپایە عەلی کوڕی حەمدونە، هێرشی کردەسەر و سەرکوتی کرد و سامانی ئەم کاروانەی بەڕەوا زانی. ئەو ژمارەیەك لەسەربازەکانی ئەم سوپایەی کوشت و باروبنەی ئەوانی تالآن کرد. عەلی کوڕی حەمدون رێگەی هەلآتنی گرتەبەر. دواتر ئەیووب ئەو سوارچاکانەی بۆ هێرش کردنە سەر سوپای مەهدی ڕەوانە کرد کەبەرەو تونس دەڕۆشتن. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و سەرئەنجام سوپاکەی قائیم هەلآت بەلآم بۆ جاری دووەم و سێیەم بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕانەوە و هاوشێوەی یەك جەستە هێرشیان کردە سەر دوژمن و ئەم جارە سوپاکەی باوکی یەزید شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا و سامانەکانیان تالآن کرا. ئەیووب و سوپاکەی لەرەبیع الاوەلی ساڵی ٣٣٤/ نۆڤەمبەری ٩٤٥ زایینی بۆ قیروان هەلآتن.

ئەم شکستە بۆ باوکی یەزید گران بوو و مەبەستی هەلآتن لەقیروانی کرد. هاوەلآنی پێشنیاریان پێکرد چاوەڕوان بێت و بەپەلە هیچ کارێك ئەنجام نەدات. باوکی یەزید سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و دووبارە ئەیووبی کوڕی بۆ جەنگی عەلی کوڕی حەمدون لەشوێنێك بەناوی بەلْتە ڕەوانە کرد. دوو سوپا دەجەنگان و هەندێ کات ئەم سوپایە و هەندێ کات ئەوی دیکە سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا. عەلی سوپایەکی بۆ پارێزگاری کردنی شارەکە دانابوو کە لەکەسانی باوەڕپێکراوی خۆی پێکدەهاتن. یەکێك لەدەروازەکان لەدەستی سەرکردەیەك بەناوی ئەحمەد بوو. ئەو پەیامی بۆ ئەیووب نارد و لەبری وەرگرتنی بڕێك پارە بڕیاریدا دەروازەکەی تەسلیم بکات. ئەیووب رازی بوو. کاتێك بۆ گرتنی دەروازەکە جەنگێکی درۆینەی دەست پێکرد، ئەحمەد دەروازەکەی بۆ ئەیووب کردەوە و سوپاکەی باوکی یەزید ڕۆشتنە ناو شارەکە و ژمارەیەکی زۆریان کوشت. عەلی لەگەڵ سێسەد سوار و چوارسەد پیادە بەرەو کەتامە هەلآت و پەیامی بۆ هۆزەکانی کەتامە، نەفەزە، مەزانە و هۆزەکانی دیکە نارد و داوای هاوکاری کرد. بەم شێوەیە سوپایەکی گەورە لەدەوری کۆبوونەوە. عەلی لەشاری قوسەنتینە ئوردووی لێدا.

عەلی سوپایەکی بۆ هەوارە نارد وئەوانی کوشتار و سامانەکانی تالآن کرد. باوکی یەزید پشتی بەدانیشتوانی هەوارە دەبەست. باوکی یەزید ئەم هەواڵەی پێگەیشت و سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی عەلی ڕەوانە کرد. چەندین جەنگ روویدا ولەم جەنگانەدا عەلی و سوپاکەی قائیم سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. عەلی شاری تیجس و باغایەی لەسوپاکەی باوکی یەزید پاك کردەوە.

## گەمارۆخستنە سەر سوسە لەلایەن باوکی یەزید و هەڵاتنی ئەو لەو شارە

کاتێك باوکی یەزید شکستی سوپاکەی خۆی بینی، قایم کاری کرد و سوپای کۆکردەوە و لەشەشی جومادی الاخرەی ئەم ساڵە/ بیست و پێنجی ژانویەی ٩٤٥ زایینی ڕێگەی سوسەی گرتەبەر. سوپایەکی گەورەی قائیم لەم شارەدا بوو. باوکی یەزید گەمارۆی خستە سەر شارەکە و هەموو رۆژێك جەنگی لەگەڵ سوپای قائیم دەکرد، جارێك سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا و جارێك رووبەرووی شکست دەبوویەوە. باوکی یەزید عارەبانە جەنگی و بەردهاوێژەکانی بەکار دەبرد و بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ئەو شارە کوژران تا ئەوەی قائیم کوڕەکەی، ئیسماعلی مەنسوری لەمانگی رەمەزان/ ئاوریل وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و خۆی مرد و بەم شێوەیە مەنسوری کوڕی- ئامارژەی پێدەدرێت- فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست. مەنسور لەترسی نزیك بوونەوە سوپاکەی باوکی یەزید کەسی لەمەرگی باوکی ئاگادار نەکردەوە چوونکە باوکی یەزید دەستی بەسەر سوسەدا گرتبوو.

مەنسور لەم کاتەدا چەندین کەشتی دروست کرد و پیاوە جەنگییەکانی لەکەشتییەکاندا جێگیر و بەرەو سوسە ڕەوانەی کردن. ڕەشیقی دەبیر و یەعقوب کوڕی ئیسحاقی کردە فەرماندەی ئەوان و پێشنیاری پێنەکردن تا کاتێك فەرمانی نەداوە، جەنگ دەستپێنەکەن. ئەو خۆی رۆژی دواتر ڕێگەی سوسەی گرتەبەر و هاوەڵانی بێ ئاگا بوون. کاتێك نیوەی ڕێگەی بڕی، سوپاکەی مەنسور لەهاتنی ئەو

ئاگادار بوونەوە و بەپاڕانەوە داوایان لێکرد بگەڕێتەوە و گیانی خۆی رووبەرووی مەترسی نەکاتەوە. مەنسور گەڕایەوە و داوای لەڕەشیق و یەعقوب کرد پیاوانە بجەنگن. ئەوان کاتێك گەیشتنە سوسە کەباوکی یەزید چیلکە وچەوێڵی لەسەر دیوارەکان کۆکردبوویەوە بۆ ئەوەی ئاگر هەڵگیرسێنێت. باوکی یەزید بەردهاوێژێکی زۆر گەورەی دروست کردبوو. کەشتییەکانی مەنسور گەیشتنە سوسە. سەرنشینەکانی کەشتی بۆ جەنگی باوکی یەزید بەرێکەوتن و باوکی یەزید، سوار لەسەر ئەسپ هاتەدەر و جەنگ دەستی پێکرد. دەستەیەك لەسوپاکەی مەنسور هەڵاتن و پەنایان بۆ شارەکە برد. ڕەشیق ئاگری بەردایە بەرد هاوێژەکە و ئەو چیلکە و چەوێڵەی باوکی یەزید کۆی کردبوویەوە و دووکەڵێکی ئەوتۆ بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە کەدنیا تاریك بوو. ئاگر بڵێسەی دەسەند.

باوکی یەزید و سوپاکەی کاتێك ئەم بارودۆخەیان بینی، ترسان و گومانیان کرد سوپاکەیان لەو ناوچەیە لەناو چووە کەسوپاکەی مەنسور توانیویانە ئاگر لەچیلکە و چەوێڵەکە بەربدەن بۆ ئەوەی کەس کەس نەبینێت. باوکی یەزید وسوپاکەی هەڵاتن و سوپاکەی مەنسور هاتنە ناو گۆڕەپانەکە و شمشێریان خستە ناو پاشماوەی وەحشییەکان و خێوەتەکانیان سووتاند.

باوکی یەزید بەخێراییەکی ئەوتۆ هەڵهات کەهەمان رۆژ گەیشتە قیروان و سوپاکەی بێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە، ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. هەرکەس لەشمشێری رزگاری بوو، بەرسیەتی و تینویەتی بەرۆکی گرت.

کاتێك باوکی یەزید گەیشتە قیروان، دانیشتوانی شارەکە ڕێگەیان نەدا بڕواتە ناو شارکە. قیروانییەکان هێرشیان کردە سەر ماڵی کارگوزارەکەی و گەمارۆیان خستەسەر و ویستیان دەرگاکە بشکێنن. کارگوزار دیناری بەسەر خەڵکاندا بڵاو کردەوە و ئەوان سەرقاڵی کۆکردنەوەی دینارەکان بوون و بەم شێوەیە کارگوزار توانی خۆی بەباوکی یەزید بگەیێنێت. باوکی یەزید هاوسەرەکەی خۆی دایکی ئەیووبی هەڵگرت و هاورێکانی بنەماڵەکەی خۆیان هەڵگرت و بەدوای ئەو بەرێکەوتن و روویان کردە کەنارەکانی سەبیبە. دووری سەبیبە لەقیروان دوو رۆژ ڕێگە بوو. ئەوان لەو شارە ئۆردوویان لێدا.

## زاڵبوونی مەنسور لەقیروان و شکستی باوکی یەزید

کاتێك هەواڵی هەڵاتنی باوکی یەزید بەمەنسور گەیشت، لەبیست و سێی شەوالی ئەم ساڵە/یانزەی جونی ٩٤٦ زایینی مەبەستی سوسەی کرد و لەدەرەوەی شارەکە خێوەتی هەڵدا و لەکردەوەی قیروانییەکان شادمان بوو. نامەیەکی بۆ نووسین و ئەمانی بەهەمووان بەخشی چوونکە پێشتر بەهۆی ملکەچ بوونیان بۆ فەرمانەکانی باوکی یەزید لێیان توورە بوو. کەسی نارد تا جاری ئەمان لەناو ئەوان بەرز بکاتەوە. دڵی قیروانییەکان ئاسوودە و مەنسور بەرەو شارەکەیان بەرێکەوت و لەپێنجشەممە بیست و چواری شەوال/ دوانزەی جون گەیشتە ئەو شارە. دانیشتوانی شار پێشوازییان لێکرد و مەنسور ئەمانی پێبەخشین و بەڵێنی چاکەی پێدان.

مەنسور لەقیروان ژمارەیەك لەبنەماڵەی باوکی یەزید و مناڵەکانی ئەوی گرت و ئەوانی بۆ مەهدییە ڕەوانە کرد. ڕۆژانەی بۆ دیاریکردن.

لەم کاتەدا باوکی یەزید سوپاکەی خۆی ئامادە و دەستەیەکی بۆ قیروان ڕەوانە کرد تا لەهەواڵەکانی ئەو شارە ئاگاداری بکەنەوە. مەنسور لەڕەوانە کرانی ئەم دەستەیە ئاگادار بوویەوە و دەستەیەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد. ئەم دوو سوپایە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و دەستیان بۆ شمشێر برد. سوپاکەی باوکی یەزید کەبۆسەیان نابوویەوە، پاشەکشێیان کرد و سوپای مەنسور شوێنیان کەوتن کە لەناکاو سەربازەکانی ناو بۆسەکان هاتنەدەر و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی مەنسوریان کوشت یا بریندارییان کردن.

کاتێك خەڵکان لەم سەرکەوتنە ئاگادار بوونەوە، بەخێرایی پەیوەستی باوکی یەزید بوون و ژمارەی سوپاکەی زیادی کرد و بەمەبەستی جەنگ ڕێگەی قیروانی گرتەبەر. مەنسور بەدەوری سوپاکەی خەندەکەی هەڵکەندبوو. باوکی یەزید سوپاکەی کردە سێ دەستە و لەگەڵ شاسوارەکانی سوپاکەی مەبەستی خەندەکەکەی کرد. ئاگری جەنگ هەڵگیرسا و مەنسور سەرکەوتنی لەئامێز گرت.

جارێکی دیکە سوپاکەی باوکی یەزید بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕانەوە. مەنسور خۆی شمشێری بەدەستەوە گرت و هێرشی دەکردە سەر چەپ و ڕاست. ئاڵاکەیان وەك سایەوان لەسەر سەری ڕاگرتبوو. پێنسەد شاسوار هاوڕێیەتیان دەکرد و باوکی یەزید سی هەزار کەسی لەگەڵدا بوو. سوپاکەی مەنسور ریسوایانە شکستی خوارد و سوپاکەی باوکی یەزید ڕژانە ناو خەندەکەکە و تالانییان دەست پێکرد. مەنسور تەنیا بیست سواری بۆ مایەوە.

باوکی یەزید مەبەستی مەنسوری کرد. کاتێك مەنسور باوکی یەزید و سوپاکەی بینی، شمشێرەکەی دەرکێشا و لەشوێنەکەی خۆڕاگری کرد. بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەلاماری باوکی یەزیدیدا ئەوەندەی نەمابوو بیکوژێت. باوکی یەزید هەڵات و مەنسور، هەرکەسێکی گرت، کوشتی و کەسی نارد تا سوپاکەی بگەڕێنێتەوە. بەم شێوەیە سوپاکەی مەنسور گەڕایەوە. ئەوان دوای شکست، ڕێگەی سوسە و مەهدییەیان گرتبووە بەر. جەنگ تا نیمەڕۆ درێژەی کێشا و ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپاکەی باوکی یەزید کوژرا. ئەم ڕۆژە لەرابردوودا هاوشێوەی بۆ نەبینراوە.

خەڵکان بوێرییەکی ئەوتۆیان لەمەنسوردا بینی کەگومانیان نەدەکرد و بەم شێوەیە شکۆ و پێگەی ئەو بەرز بوویەوە. باوکی یەزید لەکۆتاییەکانی زیقەعدەی ٣٣٤/ دەیەی یەکەمی ژوئیەی ٩٤٦ زایینی قیروانی بەجێهێشت و گەڕایەوە بەڵام کەس بۆ جەنگی ئەو نەڕۆشت. باوکی یەزید چەند ڕێك گەڕایەوە تا ئەوەی مەنسور لەناو خەڵکان جاڕیدا: هەرکەس سەری باوکی یەزید بێنێت، دەهەزار دیناری پێدەدرێت. مۆڵەتی جەنگی بەخەڵکاندا. شەڕێکی قورس دەستیپێکرد و سوپاکەی مەنسور بۆ ناو خەندەکەکان هەڵاتن بەڵام دواتر سوپاکەی باوکی یەزید شکستیان خوارد و بۆ دوو دەستە دابەش بوون. دەستەیەکی فراوان لەوان کوژرا. جەنگ هەندێ جار لەبەرژەوەندی ئەم سوپایە و هەندێ جار لەبەرژەوەندی سوپاکەی دیکەدا بوو. باوکی یەزید بەردەوام دەستە جەنگییەکانی دەنارد و ڕێگەی سوسە و مەهدییەی تالان دەکرد.

لەم کەین و بەینەدا باوکی یەزید کەسی بۆ لای مەنسور نارد و داوای لێکرد ژن

و منداڵەکانی کە لەقیروان دەستبەسەر کرابوون، ئازاد بکات و ئەگەر ئەو کارە بکات، خۆی و سوپاکەی داوای ئەمان دەکەن و گوێرایەڵی خۆیان بۆ فەرمانەکان نیشان دەدەن. چەندین سوێندی گەورەی خوارد. مەنسور بەداواکەی رازی بوو و بنەماڵەکەی هێنایە بارەگاکەی خۆی و خەلاتی پێبەخشین و بەجل و بەرگی رازاوە دایپۆشین و بەرەو مەکرەمین ڕەوانەی کردن. کاتێك گەیشتنە لای باوکی یەزید، باوکی یەزید، هەموو پەیمانەکانی خۆی شکاند و وتی: مەنسور لەترسی من ئەوانی گەڕاندەوە بۆ من. بەم شێوەیە ساڵی ٩٤٥/٣٣٤ زایینی تێپەڕی کرد و ساڵی ٩٤٦/٣٣٥ زایینی دەستی پێکرد. دوو سوپا لەجەنگ بەردەوام بوون.

لەپێنجی موحەرەم/ بیست و نۆی ئۆگۆست، باوکی یەزید پێشڕەوی کرد. مەنسور سوار ئەسپەکەی بوو و شمشێری دەرکێشا. لەنێوان دوو سوپا جەنگێکی ئەوتۆ روویدا کەوێنا ناکرێت. سوپا وەحشییەکەی باوکی یەزید، هێرشیان دەکردە سەر مەنسور و مەنسور بەهەمان شێوە. وەحشییەکان دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لیّ کوژرا، هەلاتن. لەنیوەی موحەرەم/ دەی سێپتامبەر، مەنسور سوپاکەی خۆی رازاندەوە و سەربازەکانی ئەفریقییەی لەباڵی راست و هۆزی کەتامەی لەباڵی چەپ جێگیر کرد و خۆی و کۆیلەکانی لەناو دڵی سوپاکەی جێگیر بوون. جەنگێکی مەترسیدار دەستی پێکرد. باوکی یەزید هێرشی کردە سەر باڵی راست و پاشەکشێی پێکردن. دواتر هێرشی کردە سەر دڵی سوپا. مەنسور پێشدەستی کرد و وتی: پشت بەخوا ئەمڕۆ رۆژی سەرکەوتنە و لەگەڵ سوپاکەی هاوشێوەی یەك جەستە هێرشیان برد. باوکی یەزید هەلات. سوپاکەی مەنسور شمشێریان دەوەشاند و سوپاکەی باوکی یەزید وەك گەلای دار دەکەوتنە سەرزەوی و هەڵدەهاتن و باروبنەی خۆیان بەجێدەهێشت. باوکی یەزید بیّ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، لەهەلاتن بەردەوام بوو. ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی کوژران. ژمارەی سەری بڕاوی سەربازەکانی کەدەست سوپاکەی مەنسور کەوت، دە هەزار سەر بوو. باوکی یەزید تا مەدیت هەلات.

## کوژرانی باوکی یەزید

کاتێك باوکی یەزید بەتەواوی شکستی خوارد، مەنسور سوپای رازاندەوە بۆ ئەوەی شوێنپێی هەڵبگرێت. ئەو لەکۆتاییەکانی رەبیع الاوەل/ دەیەی کۆتایی ئۆکۆتبەری ئەم ساڵە بەرێکەوت و شارەکەی بەمەزامی سەقەلی سپارد. مەنسور رۆژێك بەباوکی یەزید گەیشتەوە کەگەمارۆی خستبوو سەر شاری باغایە چوونکە دوای شکست دەیویست بڕواتە ناو ئەو شارە بەڵام رووبەرووی بەرگری دانیشتوانی شارەکە بوویەوە و گەمارۆی خستبووە سەر. کاتێك باوکی یەزید لەگرتنی شارەکە نزیك بوویەوە، مەنسور گەیشت. باوکی یەزید هەڵات. دەڕۆشتە هەر شوێنێك بۆ ئەوەی سەنگەر و پەنای تیا بگرێت، مەنسور پێشتر دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا دەگرت تا ئەوەی گەیشتە تینە. لەم کاتەدا محەممەد کوڕی خزری زەناتی، لەهاوەڵە نزیکەکانی باوکی یەزید، نوێنەری بۆ لای مەنسور نارد و داوای ئەمانی کرد. مەنسور ئەمانی پێبەخشی و فەرمانی پێدا چاودێری باوکی یەزید بکات. باوکی یەزید لەهەڵاتن بەردەوام بوو تا گەیشتە کێوی بەربەرییەکان بەناوی بەرزال. دانیشتوانی ئەو دەڤەرە هاوباوەڕی باوکی یەزید بوون. ئەو لەرێگەی ریخەڵانەوە دەڕۆشت بۆ ئەوەی شوێن پێکانی بەجێ نەمێنێت. ژمارەیەکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو بۆ سنورەکانی مەقبەرە، ئەو شوێنەی مەنسوری لێ بوو، گەڕایەوە. باوکی یەزید بەژمارەیەك لەسەربازەکانی بۆسەی نایەوە. کاتێك سوپاکەی مەنسور گەیشت، سەربازەکانی ناو بۆسەکانی بینی و خۆیان بەدوور گرت. باوکی یەزید سوپاکەی کۆکردەوە و شەڕ دەستی پێکرد. باڵی راستی مەنسور شکستی خوارد. مەنسور و هاوەڵانی هێرشیان برد و باوکی یەزید بۆ چیای سالات هەڵات. مەنسور شوێنی کەوت و ڕۆشتە شاری مەسیلە و لەشوێنکەوتنی باوکی یەزید ڕۆشتە چیا دژوارەکان و دۆڵە قووڵەکان. دەیویست بۆ گرتنی ئەو لەڕۆشتن بەردەوام بێت بەڵام رێنیشاندەرەکان ئاگاداریان کردەوە کەهیچ سوپایەك لەم رێگەیە گوزەری نەکردووە. بارودۆخ بۆ سوپاکەی مەنسور

دژوار بوو تا ئەو جێگەی بەهای ئالیکی چوارپێ بۆ یەك دینار و نیو بەرز بوویەوە و بەهای مەشکێك ئاو، بۆ یەك دینار. پاشماوەی رێگە ریخەڵاَن بوو و دەشتە بێ ئاو و گیاکان کەبەسودان دەگەیشت. سەرزەمینێك بێ هیچ ئاوەدانی. باوکی یەزید مەرگی بەهۆی برسیەتی و تینویەتی هەڵبژاردبوو تا ئەوەی بەشمشێر بکوژرێت.

مەنسور بەبیستنی ئەم هەواڵە بۆ سەرزەمینی سەنهاجە گەڕایەوە و گەیشتنە ئاوەدانییەك بەناوی دەمرە. چاوی بەئەمیر زیری کوڕی مەنادی سەنهاجی حومەیری و سوپاکەی سەنهاجە کەوت. زیری باوەگەوڕیی منالەکانی بادیس، ئەمیرەکانی ئەفریقییە بوو – بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین– مەنسور رێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. لەم کاتەدا نامەی محەممەد کوڕی خزر بەدەستی مەنسور گەیشت و ئەوی لەو ریخەڵاَنەی باوکی یەزید لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد، ئاگادار کردەوە.

مەنسور گرفتاری نەخۆشی ببوو و کاتێك لەنەخۆشی رزگاری بوو، لەدووی رەجەب/ نۆزدەی فەوریە رێگەی مەسیلەی گرتەبەر. باوکی یەزید کاتێك لەنەخۆشی مەنسور ئاگادار بوویەوە، پێشتر خۆی گەیاندە ئەو سەرزەمینە و گەمارۆی خستبووە سەر. کاتێك مەنسور مەبەستی ئەو شارەی کرد، باوکی یەزید بەرەو سودان هەلاَت. منالەکانی کەملان و هەوارە پێی رازی نەبوون و فریویاندا و ئەو بەناچاری بەرەو چیاکانی کەتامە و عەجیسە و شوێنەکانی دیکە، ملی رێگەی گرتەبەر و لەوێ سەنگەری گرت. دانیشتوانی ئەو سەرزەمینانە لەدەوری کۆبوونەوە و هەندێ کات لەچیاکان دەهاتنەخوار و تالاَنییان دەکردە پیشە. مەنسور لەدەی شەعبان/ بیست و نۆی مارس مەبەستی جەنگ لەگەڵ باوکی یەزیدی کرد بەلاَم ئەو لەچیا نەهاتە خوار و کاتێك سوپاکەی مەنسور گەڕایەوە، باوکی یەزید خۆی بەدواوەی سوپاکەی گەیاند. مەنسور گەڕایەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. باوکی یەزید شکستی خوارد بەلاَم زیان بەمناڵ و هاورێکانی نەگەیشت. دوو سوار خۆیان پێ گەیاند و ئەسپەکەیان کوشت. ئەو لەئەسپەکەی کەوتەخوار. یەکێك لەهاوەلاَنی ئەوی سوار زینی ئەسپەکەی خۆی کرد بەلاَم زیری کوڕی مەناد خۆی پێگەیاند و بریندازی کرد. ئەو دووبارە لەئەسپ کەوتەخوار.

جەنگ گەرم و مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد بەڵام هاوەڵانی رزگاریان کرد. سوپاکەی مەنسور شوێنیان کەوتن و دە هەزار کەسیان لێ کوشتن.

مەنسور لەسەرەتای رەمەزان/ حەقدەی ئاوریل شوێن باوکی یەزید کەوت و شەڕێکی قورس لەنێوان دوو سوپا دەستی پێکردەوە. هیچ کام لەم دوو سوپایە لەبەر دژواری و ناخۆشی شوێنەکە رێگەی هەڵاتنیان نەبوو. ئەم جارەیش باوکی یەزید شکستی خوارد و باروبنەکەی بوو بەخۆراکی ئاگر. سوپاکەی ئەو بەرەو لوتکەی چیاکە سەرکەوتن و لەوێوە بەردی گەورەیان بەسەر سوپاکەی مەنسوردا تل دەکردەوە. جەنگ بەرادەیەك لەمەنسور نزیك ببوویەوە کەدەست بەدەست دەگەیشت و گومان دەکرا هەموو شتێك کۆتایی پێدێت. دوو سوپا بێ سەرکەوتن لەیەك جیابوونەوە. باوکی یەزید پەنای بۆ قەڵای کەتامە برد. قەڵایەکی بڵند و لەوێ پارێزگاری لەخۆی کرد.

لەهەمان رۆژ سوپاکەی مەنسور لەکەتامە پیاوێکیان هێنایە لای کەخۆی بەخوا ناو دەبرد و لەکەتامە دەرکەوتبوو. مەنسور فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. هۆزی هەوارە و زۆربەی کەسانی پەیوەست بەوان داوای ئەمانیان لەمەنسور کرد. مەنسور ئەمانی پێبەخشین و بەرو قەڵای کەتامە بەرێکەوت. لەوێ گەمارۆی خستە سەر باوکی یەزید و سوپاکەی لەو ناوچەیە بڵاوە پێکرد. سوپاکەی باوکی یەزید رووبەروویان بوونەوە و مەنسور لەپێشڕەوی بەردەوام بوو. لەکۆتایی رۆژ سوپاکەی دەستیان بەسەر بەشێکی قەڵاکەدا گرت وگڕیان تێبەردا. سوپاکەی باوکی یەزید هەڵاتن و دەکوژران. باوکی یەزید لەگەڵ منداڵ و گەورەکانی خۆی ڕۆشتنە یەکێك لەکۆشکەکانی قەڵاکە. دەرگاکانی ئەم کۆشکە سووتا و بۆنی مەرگیان کرد. مەنسور فەرمانیدا بەدەوری چیاکە و لەبەردەم ئەوان ئاگرێکی گەورە بکەنەوە تا باوکی یەزید رێگەی هەڵاتنی نەبێت. لەبەر گەورەیی ئاگرەکە شەو وەك رۆژ بەرچاو دەکەوت.

کاتێك شەو کۆتایی پێهات، شوێنکەوتەکانی باوکی یەزید لەکاتێکدا ئەویان لەسەر شان بوو، هاتنەدەر و هێرشیان کردە سەر سوپاکەی مەنسور. سوپاکەی مەنسور رێگەیان بۆ کردنەوە و ئەوان خۆیان گەیاندە ئاگرەکە و ژمارەیەکی زۆریان

لەقەڵاکە هاتنەدەر. سەربازەکانی مەنسور ئەوانیان گرت. مەنسوریان ئاگادار کردەوە کەباکی یەزید هاتۆتەدەر. مەنسور فەرمانیدا شوێنی کەون و وتی: گومان دەکەم ئەو لەم نزیکانەدا بێت. لەو کاتەدا باوکی یەزیدیان هێنا. سێ پیاو ئەویان خستبووە سەرشان و لەقەڵاکە هێنابوویانەدەر و دواتر ئەویان دانابوو و هەڵاتبوون. هاوەڵانی لەبەر ئەوەی شەل بوو، ئەویان خستە سەرشان. ئەو کاتێك دەیویست بەشەلەشەل لەشوێنێکی سەخت بێتە خوار، کەوتبوو. ئەویان گرت و بردیانە لای مەنسور. مەنسور بۆ سپاس کردنی پەروەردگار ناوچاوی لەزەوی سوو و خەڵکان دەنگی تەکبیریان بەرز کردەوە. باوکی یەزید تا کۆتایی مانگی موحەرەمی ٣٣٦/ بیست و دووی نۆگۆستی ٩٤٧ زایینی لای مەنسور مایەوە تا ئەوەی بەهۆی سەختی برینەکەیەوە مرد. مەنسور فەرمانیدا ئەویان خستە ناو قەفەسێك و دوو مەیمونی لەگەڵ ئەو خستە ناو قەفەسەکە کەگەمەیان لەگەڵ دەکرد. دواتر مەنسور فەرمانیدا کەوڵی بکەن (پێستی داماڵن) و ناوەکەی پڕ کەن لەکا. مژدەی ئەم سەرکەوتنەی بۆ هەموو شوێنێك نووسی.

دواتر چەند کەسێك لەخەواریج وەك محەممەد کوڕی خزر دژی مەنسور ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە. مەنسور لەساڵی ٩٤٧/٣٣٦ زایینی سەرکەوتنی بەسەر محەممەد بەدەست هێنا. محەممەد خوازیاری سەرکەوتنی باوکی یەزید بوو. فەزڵ کوڕی باوکی یەزید شۆڕشی کرد و خراپەکاری کردە پیشە و ڕێگەکانی دەبڕی. یەکێك لەهاوەڵانی فریویدا و کوشتی و لەساڵی ٣٣٦/ ٩٤٧ زایینی سەری ئەوی وەك دیاری بۆ مەنسور نارد. مەنسور بۆ مەهدییە گەڕایەوە و لەرەمەزان، ئاوریلی ئەم ساڵە، ڕۆشتە ناو شارەکە.

## کوژرانی باوکی حسەینی بورەیدی و سووتانی ئەو

لەرەبیع الاوەل/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە باوکی حسەینی بورەیدی ڕۆشتە بەغداد و داوای ئەمانی لەتەوزون کرد. تەوزون ئەمانی پێبەخشی و باوکی جەعفەر کوڕی شێرزاد ئەوی لایماڵەکەی خۆی نیشتەجێ و چاکەی لەگەڵ کرد. باوکی حسەین دەیویست ئەوان بۆ جەنگی برازاکەی هاوکاری بکەن و بەڵێنیدا بوو ئەگەر دەست بەسەر بەسرەدا بگرێت سامانێکی زۆر بەوان (تەوزون و کوڕی شێرزاد) دەدات. ئەوانیش بەڵێنی هاوکارییان پێدابوو. لەم کاتەدا برازاکەی لەبەسرەوە سامانێکی بەرچاوی بۆ تەوزون و کوڕی شێرزاد نارد و ئەم دووانەیش خەڵاتیان بۆ ڕەوانە کرد و ئەویان لەسەر فەرمانڕەوایەتییەکەی هێشتەوە.

کاتێك باوکی حسەین بێ هیوا بوو، هەوڵیدا خۆی ببێتە دەبیری تەوزون و باوکی جەعفەر کوڕی شێرزاد لەو کارە دوور بخاتەوە. کوڕی شێرزاد لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە و هەوڵیدا و سەرئەنجام باوکی حسەینی گرت و قامچی بارانی کرد. باوکی عەبدوللە کوڕی باوکی موسای هاشمی لەرۆژگاری ناسرئەلدەولە فتوای فەقیە و قازییەکانی بۆ کوشتن و ڕەوا بوونی خوێنی باوکی حسەین وەرگرتبوو. کوڕی شێرزاد ئەم فتوای هێنا و فەقیە و قازییەکانی لەکۆشك کۆکردەوە و فەرمانیدا باوکی حسەین بێنن. لەفەقیهەکان سەبارەت بەو فتوایە پرسیاری کرد و هەمووان پشت راستیان کردەوە. کوڕی شێرزاد فەرمانی سەربڕینی ئەوی دەرکرد و جەستەیان بەدارەوە هەڵواسی. دواتر جەنازەکەیان سووتاند و ماڵەکەیان تالان کرد. ئەمە کۆتایی بورەیدییەکان بوو. ئەو لەنیوەی زیحەجە/ سی جولای کوژرا.

لەم ساڵەدا خەلیفە موستەکفی، قاهیر باللە ی لەکۆشکی خەلافەتەوە بۆ ماڵی کوڕی تاهیر نارد. قاهیر لەم کاتەدا بەرادەیەك هەژار ببوو کەتەنیا عابایەکی پەمووی لەبەردا و جووتێك پێڵاوی دارینی لەپێدا بوو.

## ڕۆشتنی باوکی عەلی بۆ ڕەی و گەڕانەوەی ئەو پێش گرتنی ئەو شارە

کاتێك ئەمیر نوح لەسنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی لەخوراسان و ماوەرائەلنەهر جێگیر بوو، فەرمانی بەباوکی عەلی کوڕی موحتاجدا لەگەڵ سوپاکەی خوراسان بەرەو رەی بڕوات و رۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە لەو شارە دەربەڕێنێت. باوکی عەلی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوت. لەرێگە وەشمگیری بینی کەدەیویست سەردانی ئەمیر نوح بکات. باوکی عەلی ئەوی بۆ لای ئەمیر نوح نارد کەلەو کاتەدا لەمەرو بوو. کاتێك وەشمگیر گەیشتە لای ئەمیر نوح، ئەمیر، رێزی گرت و چاکەی لەگەڵدا کرد.

باوکی عەلی بۆ گەیشتن بەڕەی درێژەی بەرێگەی خۆیدا. کاتێك گەیشتە بێستام، دەستەیەك لەهاوەڵانی رێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و لەگەڵ مەنسور کوڕی قەراتکین کە لەهاوەڵە گەورەکانی نوح و کەسە نزیکەکانی ئەو بوو، ئالأی شۆڕشیان بەرز کردەوە و رێگەی جورجانیان گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی حەسەن کوڕی فیرزاندا بوو. حەسەن رێگەی نەدان بڕۆنە ناو شارەکە و ئەوان رێگەی نەیشابوریان گرتەبەر. باوکی عەلی و سوپاکەی درێژەیان بەرێگەی خۆیاندا. رۆکن ئەلدەولە رووبەڕووی بوویەوە و دوو سوپا لەسێ فەرسەخی شارەکە بۆ جەنگ ریزیان بەست. دەستەیەك لەکوردەکان لەناو سوپاکەی باوکی عەلی دەبینران. ئەوان فریویان لەباوکی عەلی کرد و خوازیاری وەرگرتنی ئەمان لەرۆکن ئەلدەولە بوون. بەم شێوەیە باوکی عەلی شکستی خوارد و بۆ نەیشابور گەڕایەوە و بەشێك لەسامانەکەی تالأن کرا.

## زاڵبوونی وەشمگیر لەجورجان

کاتێك باوکی عەلی بۆ نەیشابور گەڕایەوە، لەرێگە وەشمگیری بینی. ئەمیر نوح، وەشمگیری لەگەڵ سوپایەك کەمالك کوڕی شەکرتەکین لەناویاندا دەبینرا، ڕەوانە کرد و پەیامی بۆ باوکی عەلی نارد تا هاوکاری وەشمگیر بکات. باوکی عەلی ژمارەیەك لەسوپاکەی خۆی بەرەو جورجان ڕەوانە کرد تا هاوکاری وەشمگیر بکەن. کاتێك گەیشتنە جورجان، جەنگ دەستی پێکرد و حەسەن کوڕی فیرزان شکستی خوارد و سەرئەنجام وەشمگیر لەسەفەری ٣٣٣/ سێپتامبەری ٩٤٤ زایینی دەستی بەسەر جورجاندا گرت.

## زاڵبوونی باوکی عەلی لەڕەی

لەم ساڵەدا باوکی عەلی بۆ لای نوخح لەمەڕو ڕۆشت بەڵام نوح ئەوی بۆ نەیشابور گەڕاندەوە وفەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر ڕەی. ژمارەیەکی زۆری سوپاییەکانی خستە بەردەست. باوکی عەلی بۆ نەیشابور گەڕایەوە و لەجومادی الاخرە/ ژانویە رێگەی ڕەی گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی ڕۆکن ئەلدەولەدا بوو. کاتێك ڕۆکن ئەلدەولە لەفراوانی ژمارەی سوپاکەی ئاگادار بوویەوە، شارەکەی بەجێهێشت و باوکی عەلی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. هەروەها کەنارە کوێستانییەکانی خستە ژێر فەرمانی خۆی و کارگوزارەکانی خۆی ڕەوانە کرد. ئەم پێشهاتە لەمانگی ڕەمەزان/ ئاوریل ڕوویدا.

دواتر نوح لەمەرو، رێگەی نەیشابوری گرتەبەر و لەرەجەب/ فەوریە گەیشتە ئەوشارە و بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژ مایەوە. لەم کاتەدا دوژمنەکانی باوکی عەلی دەستەیەك لەئاژاوەچییەکانیان هاندا و ئەوان کۆبوونەوە و هاواری دادخوازیان بەرز کردەوە و لەخراپەکاری باوکی عەلی و کارگوزارەکانی ئەو سکاڵایان کرد. بەم شێوەیە ئەمیر نوح، ئیبراهیم کوڕی سیمجوری لەجیاتی ئەو وەك فەرمانڕەوای نەیشابور دیاریکرد ولەرەمەزان/ ئاوریل لەوێوە رێگەی بوخارای گرتەبەر. مەبەستی ئاژاوەچییەکان لەم پشێوییە ئەوە بوو باوکی عەلی تەماحی گرتنی

خوراسان نەکات و لەڕەی و کوێستانەکانی ئەو شارە بمێنێتەوە. باوکی عەلی ترسا چوونکە باوەڕی وابوو ئەمیر نوح لەبەر گرتنی ڕەی و کەنارەکانی دیکە ڕێزی لێدەگرێت بەڵام کاتێك بینی لەکار دوورخراوەتەوە، خەمبار بوو و براکەی باوکی عەباس فەزڵ کوڕی محەممەدی بۆ هەمەدان و کوێستانەکان نارد و هەمەدانی خستە ژێر فەرمانی ئەو و ئەوی کردە جێگری خۆی لەسەر سوپاکەی. فەزڵ مەبەستی نەهاوەند و دەینەوەر و شارەکانی دیکەی کرد و دەستی بەسەر ئەو شارانەدا گرت. سەرکردە کوردەکانی ئەم دیارە داوای ئەمانیان لێکرد و بارمتەکانی خۆیان بۆ لای ئەو نارد.

## گەیشتنی مۆعیزئەلدەولە بۆ واست و گەڕانەوەی ئەو لەو شارە

لەکۆتایی ڕەجەب/ هەژدەی مارسی ئەم ساڵە، مۆعیز ئەلدەولە باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی بویە گەیشتە واست. تەوزون لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ موستەکفی لەبەغدادەوە بەرەو واست بەڕێکەوت. کاتێك مۆعیز ئەلدەولە لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، لەشەشی ڕەمەزان/ بیست و سێی ئاوریل واستی بەجێهێشت و خەلیفە و تەوزون گەیشتنە واست. باوکی قاسمی بورەیدی کەسی نارد وبەڵێنی کۆکردنەوەی باجی بەسرەیدا. تەوزون بەپێشنیارەکەی بورەیدی ڕازی بوو و بەڵێنی لێسەند و بەسرەی خستە ژێر فەرمانی ئەو. دواتر لەگەڵ خەلیفە بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەهەشتی شەوال پانزەی مەی گەیشتنە بەغداد.

## زاڵبوونی سەیف ئەلدەولە لەحەلەب و حیمس

لەم ساڵەدا سەیف ئەلدەولە عەلی کوڕی باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان هێرشی کردە سەر حەلەب و دەستی بەسەردا گرت و خستیە ژێر فەرمانی خۆی. ئەو لەگەڵ موتەقی لەڕەققە بوو. کاتێك موتەقی گەڕایەوە بۆ بەغداد و ئەخشید بۆ شام گەڕایەوە، یەئنسی مونسی لەحەلەب مایەوە و سەیف ئەلدەولە مەبەستی ئەوی کرد. کاتێك سەیف ئەلدەولە گەیشتە حەلەب، یەئنس شارەکەی بەجێهێشت

و بەرەو لای ئەخشید بەرێکەوت. سەیف ئەلدەولە دەستی بەسەر حەلەبەدا گرت و ڕێگەی حیمسی گرتەبەر و لەوێ ڕووبەڕووی سوپاکەی ئەخشید محەممەد کوڕی توغج، فەرمانڕەوای شام و میسر و کۆیلەکەی ئەو کافور، بوویەوە. دوو سوپا بۆ ریز جەنگیان بەست و لەکۆتاییدا، سوپاکەی ئەخشید و کافور شکستیان خوارد و سەیف ئەلدەولە ئەو شارەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و ڕێگەی دیمەشقی گرتەبەر و گەمارۆی خستەسەر بەڵام دانیشتوانی شارەکە خۆڕاگرییان کرد و ئەو بێ ئەوەی بتوانێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت، گەڕایەوە.

ئەخشید لەمیسرەوە بەرەو شام بەرێکەوت و شوێنپێی سەیف ئەلدەولەی هەڵگرت. هەردوو سوپا لەقێنسرین ڕووبەڕووی یەکبوونەوە بەڵام کەسیان سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و سەیف ئەلدەولە بۆ جەزیرە گەڕایەوە. کاتێك ئەخشید بۆ دیمەشق گەڕایەوە، سەیف ئەلدەولە دووبارە ڕێگەی حەلەبی گرتەبەر و کاتێك دەستی بەسەر شارەکەدا گرت، ڕۆمییەکان مەبەستی ئەوشارەیان کرد و سەیف ئەلدەولە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان بەرێکەوت و لەنزیك حەلەب ڕووبەڕوویان بوویەوە وسەرکەوتنی بەدەست هێنا و ژمارەیەك لەڕۆمییەکانی کوشت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەهەشتی جومادی الاوەل/ بیست و هەشتی دێسامبەری ئەم ساڵە خەلیفە موستەکفی دەبیرەکەی خۆی باوکی عەبدوللە کوڕی باوکی سلێمان و براکەی دیکەی قۆڵبەست کرد و باوکی ئەحمەد، فەزڵ کوڕی عەبدولرەحمانی شیرازی وەك بەڕێوبەری کارە تایبەتییەکانی خۆی دەستنیشان کرد. باوکی ئەحمەد لەکاتی هاتنە سەرکاری موستەکفی لەموسڵ دەبیری ناسرئەلەدەولە بوو و کاتێك لەخەلافەتی موستەکفی ئاگادار بوویەوە، هاتە بەغداد چوونکە پێشتر خزمەتی موستەکفی دەکرد و ئەرکی دەبیری ئەوی ئەو کاتەی لەماڵی کوڕی تاهیردا بوو، لەسەر شان بوو.

لەرەجەب/ فەورییەی ئەم ساڵە تەوزون لەگەڵ خەلیفە موستەکفی لەبەغدادەوە

بەرەو موسڵ بەڕێکەوت. ئەم دوانە مەبەستی ناسرئەلدەولەیان کردبوو چوونکە لەناردنی باج خۆی دوادەخست و ئەو کۆیلانەی بۆ کاروبارەکان راسپاردبوو کەلای تەوزون هەڵدەهاتن لەکاتێکدا پەیمانیان بەستبوو ناسرئەلدەولە هیچ کام لەسەربازەکانی تەوزون وەرنەگرێت.

کاتێك خەلیفە و تەوزون شاری بەغدادیان بەجێهێشت، نێوەنجیگەران بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد. باوکی جەعفەر کوڕی شێرزاد نێوەنجیگەری کرد و ناسرئەلدەولە بەناردنی باج رازی بوو.

باوکی قاسم کوڕی موکەرەم دەبیری ناسرئەلدەولە، نوێنەری ئەم کارە بوو و کاتێك ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامیگر کرا، موستەکفی و تەوزون بۆ بەغداد گەڕانەوە.

لەحەوتی رەبیع الاوەل/ بیست و نۆی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە، موستەکفی، وەزیرەکەی، باوکی فەرەجی سورمەرائی گرت و سێسەد هەزار درهەمی لێ سەند. ئەو چل و دوو رۆژ وەزیر بوو.

# تەواوی مێژوو

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێڕانی: زاهیر محەمەد رەشید

بەرگی سیازدەیەم

## چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٢

بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر


**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب : تەواوی مێژوو

بابەت :مێژوویی

بەرگی: سیازدەیەم

نوسینی: ئیبن ئەسیر

وەرگێرانی: زاهیر محەمەد رەشید

تایپ: نژۆ مستەفا

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠١٢

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان

تیراژ :١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن ( ١٢٥٢ ) ساڵی (٢٠٠٨) پێدراوە

# پێڕست

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و چواری کۆچی ( ٩٤٥ زایینی )

### مەرگی تەوزون و فەرمانڕەوایەتی کوڕی شێرزاد

لەموحەرەم/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە تەوزون لەماڵەکەی خۆی لەبەغداد مرد. ئەو بۆ ماوەی دوو ساڵ و چوار مانگ و نۆزدە ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد. کوڕی شێرزاد جگە لەسێ ڕۆژ لەو ماوەدا دەبیری ئەو بوو.

کاتی مەرگی تەوزون، شێرزاد بۆ کۆکردنەوەی باجی هیت، لەو سەرزەمینە بوو. کاتێک لەهەواڵی مەرگی تەوزون ئاگادار بوویەوە، مەبەستی ئەوەی کرد ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان وەك فەرمانـدەی دیاری بکات، بەڵام سوپاییەکان نیگەران و پەرێشان بوون و خوازیاری فەرمانـدەیی کوڕی شێرزاد خۆی بوون. کوڕی شێرزاد هات و لەسەرەتای سەفەر/ سێپتامبەر لەباب حەرب (دەروازەی جەنگ) ئوردووی لێدا و سوپاییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و بۆ فەرمانـدەیی ئەو ڕێککەوتن و سوێندیان بۆ خوارد. ئەو کەسی بۆ لای موستەکفی نارد تا سوێندی بۆ بخوات. موستەکفی رازی بوو و لای فەقیە و قازییەکان سوێندی بۆ خوارد. کوڕی شێرزاد ڕۆشتە لای خەلیفە و بەرێزدارییەوە گەڕایەوە و نازناوی ئەمیری ئەمیرەکانی پێبڕا. ژمارەی سوپاکەی بەرادەیەك فراوان بوو نەیدەتوانی بەئاسانی مانگانەی ئەوان بدات. بۆ ئەم مەبەستە باوکی عەبدوللە کوڕی باوکی موسای هاشمی بۆ لای ناسرئەلدەولە لەموسڵ نارد و داوای پارەی لێکرد. بەڵێنی پێدا فەرمانـدەیی بەو بسپێرێت. ناسرئەلدەولە پێنسەد هەزار درهەم و خواردەمەنی بۆ نارد تا لەناو سوپاکەی دابەشی بکات بەڵام بەس نەبوو. ئەو بۆ دابین کردنی مانگانەی سوپاکەی، پارەی لەسەر کارگوزار و دەبیر و بازرگانەکان کردە مانگانە (قیستی) و ستەمی لەخەڵکانی بەغداد کرد.

بەمشێوەی دزەکان دەرکەوتن و پارەکانیان فڕاند و بازرگانەکان ئەو شارەیان بەجێهێشت. کوڕی شێرزاد بەنالی کوشەی وەك کارگوزاری واست و لەشکری وەك کارگوزاری تکریت دیاریکرد. یەنال نامەی بۆ مۆعیزئەلدەولە کوڕی بویە نووسی و بۆ لای خۆی بانگی کرد. فەتحی لەشکریشی ڕۆشتە لای ناسرئەلدەولە لەموسڵ و

پەیوەستی بوو. ئەو دووبارە لەشکری وەك کارگوزاری تکریت دەستنیشان کردەوە.

## زاڵبوونی مۆعیزئەلدەولە لەبەغداد

کاتێك یەنالی کوشە بۆ مۆعیزئەلدەولە لەئەهواز نامەی نووسی و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نیشاندا، مۆعیزئەلدەولە هێرشی کردە سەر بەغداد و پشێوی وئاژاوە لەناو دانیشتووانی ئەو شارە دروست بوو. کاتێك مۆعیزئەلدەولە گەیشتە باجێسرا، موستەکفی و کوڕی شێرزاد خۆیان شاردەوە. کوڕی شێرزاد سێ مانگ و بیست ڕۆژ فەرمانڕەوا بوو. کاتێك موستەکفی خۆی شاردەوە، تورکەکان ڕێگەی موسڵیان گرتەبەر و کاتێك لەبەغداد دوورکەوتنەوە، موستەکفی بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەکۆشکی خەلافەت دانیشت. لەم کاتەدا باوکی محەممەد حەسەن کوڕی محەممەدی موهەلبی، هاوڕێی مۆعیزئەلدەولە، هاتە بەغداد و بەشێوەیەکی نهێنی چاوی بەکوڕی شێرزاد کەوت و دواتر ڕۆشتە لای موستەکفی. موستەکفی لەهاتنی مۆعیزئەلدەولە شادمانی خۆی دەربڕی و بەباوکی محەممەدی وت لەبەر ئەوەی خۆی شاردۆتەوە تا تورکەکان بڵاوەی لێبکەن و سەرکوت کردنی ئەوان بێ ڕوودانی جەنگ بۆ مۆعیز ئەلدەولە فەراهەم ببێت.

مۆعیزئەلدەولە لەیانزەی جومادی الاوەل/ بیستی دێسامبەر گەیشتە بەغداد و لەدەروازەی شەماسییە دابەزی. بەیانی ئەو ڕۆژە ڕۆشتە لای خەلیفە و بەیعەتی لەگەڵ بەست و موستەکفی سوێندی بۆ خوارد. مۆعیزئەلدەولە داوای لێکرد مۆڵەت بدات کوڕی شێرزاد خۆی ئاشکرا بکات و وەك دەبیری خۆی هەڵیبژێرێت. موستەکفی ڕازی و کوڕی شێرزاد لەشوێنی خۆشاردنەوەی هاتەدەر و چاوی بەمۆعێزئەلدەولە کەوت. مۆعیزئەلدەولە ئەوی کردە لێپرسراوی کۆکردنەوەی باج و خەلیفە جلْ و بەرگی فەرمانڕەوایەتی پێشکەش بەمۆعیزئەلدەولە کرد و هەمان ڕۆژ بەمۆعیزئەلدەولە ناوی برد (پێشتر بەو ناوە بانگ نەدەکرا) و عەلی برای بە عیماد ئەلدەولە و براکەی دیکەی، حەسەنی بەرۆکن ئەلدەولە ناو برد و فەرمانیدا نازناوەکانی ئەوان لەسەر درهەم و دینارەکان هەڵکەنن. مۆعیزئەلدەولە لەکۆشکی

مونس دابەزی و سوپاکەی لەناو ماڵی خەڵکان جێگیر بوون. خەڵکان لەم ڕووەوە گرفتاری بەدبەختی بوون و ئەم کارە دواتر لەبەغداد بوو بەنەریت. مۆعیزئەلدەولە یەکەم کەس بوو میوانداری زۆرەملێی لەبەغداد هێنایە ئاراوە. پێشتر ئەم کارە نەدەکرا. ڕۆژانەی بۆ خەرجییەکانی موستەکفی پێنج هەزار درهەمی دەستنیشان کرد کەهەندێ کات درەنگ بەدەستی دەگەیشت تا ئەوەی زەوییە ماوەکانی بەدەبیرەکەی باوکی ئەحمەدی شیرازی سپارد.

## لابردنی موستەکفی باللە لەخەلافەت

لەبیست و دووی جومادی الاخرە/ یەکی فەوریەی ئەم ساڵە خەلیفە موستەکفی لەخەلافەت دوورخرایەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: عەلەمی پێشکار (ئەو ژنەی لەکۆشک کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد) میوانییەکی گەورەی ڕێکخست و دەستەیەک لەسەرکردە تورک و دەیلەمییەکانی بۆ ئەم میوانییە بانگێشت کرد. مۆعیزئەلدەولە گومانی کرد پێشکار ئەم میوانییەی ڕێکخستووە تا لەسەرکردەکان بۆ موستەکفی بەیعەت وەربگرێت و مۆعیزئەلدەولە دووربخاتەوە. ئەو لەکردەوەکانی عەلەم بەدگومان بوو. ئیسفەهدوست ڕۆشتە لای مۆعیزئەلدەولە و وتی: خەلیفە نامەی بۆ ناردووم تا بەشێوەیەکی نەناسراو بڕۆمە لای.

دوای بیست و دوو ڕۆژ لەجومادی الاخرە، مۆعێزئەلدەولە ڕۆشتە بارەگای خەلیفە کە لێوانلێو بوو لەخەڵك. لەم کاتەدا نوێنەری فەرمانڕەوای خوراسانیش گەیشت. مۆعیزئەلدەولە دانیشتبوو کە لەناکاو دووان لەسەرکردە دەیلەمییەکان بەدەم هاوار کردنەوە هاتن و هەردووك دەستی خەلیفەیان گرت. گومان دەکرا ئەم دووانە دەخوازن دەستی خەلیفە ماچ بکەن بەڵام دەستیان بۆ درێژ کرد و لەتەختەکەی هێنایانە خوار و سەرپێچەکەیان لەدەوری ملی ئاڵاند. مۆعیزئەلدەولە لەشوێنەکەی هەستا و خەڵکان پەرێشان و شڵەژان. سامانەکانی کۆشك تاڵان کرا و دەیلەمییەکان، موستەکفییان بەپیادە تا ماڵەکەی مۆعیزئەلدەولە برد و لەوێ زیندانییان کرد. کۆشك تاڵان کرا و هیچی تیا نەمایەوە. باوکی ئەحمەدی شیرازی،

دەبیری موستەکفی، قۆڵبەست کرا. عەلەمی پێشکاریان گرت و زمانیان بڕی.

خەلافەتی موستەکفی یەك ساڵ و چوار مانگ درێژەی کێشا. تەوزون و کوڕی شێرزاد، بەردەوام بەسەر کاروبارەکانی ئەودا زاڵ بوون. کاتێك دەستی بەیعەتیان بۆ موتیع باللە درێژ کرد، موستەکفییان پێ سپارد و ئەو چاوی خەلیفە موستەکفی دەرهێنا و کوێری کرد. موستەکفی تا رەبیع الاوەلی ٣٣٨/ ئۆگۆستی ٩٤٩ لەزیندان مایەوە و دواتر مرد. ئەو لەسەفەری ٢٦٩/ ئۆکتۆبەری ٩٠٨ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. دایکی، دایکی منداڵ بوو بەناوی غەسن. موستەکفی سپی روخسار و قۆز بوو بەڵام تەپ و تۆزی پیری بەروخسارییەوە دەبینرا.

## خەلافەتی موتیع باللە

کاتێك موستەکفی خەلافەتی گرتەدەست، موتیع یا هەمان باوکی قاسم فەزڵ کوڕی موقتەدر لێی ترسا چوونکە بگرە و بێنە لەنێوان ئەوان دەبینرا و هەردووك خوازیاری خەلافەت بوون. موتیع بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت هەوڵی دەدا. موستەکفیش هەوڵەکانی بۆ گرتنی موتیع خستەگەڕ بەڵام نەیتوانی بیگرێت. کاتێك مۆعیزئەلدەولە هاتە بەغداد، وتیان موتیع پەنای بۆ بردووە و خۆی شاردۆتەوە. موتیع، مۆعیزئەلدەولەی هاندا تا سەرئەنجام ئەوی گرت و کوێری کرد. کاتێك موستەکفی قۆڵبەست کرا، لەرۆژی پێنجشەممە دوانزەی جومادی الاخرە/ بیستی ژانویە بەیعەتیان بۆ وەرگرت. موستەکفییان بردە لای و موستەکفی، موتیعی بەخەلیفە ناو برد و دەست لەکارکێشانەوەی خۆی راگەیاند.

شیرازەی خەلافەت زیاتر لەجاران تێکچوو، چیتر هیچ بۆ خەلیفەکان نەمابوویەوە چوونکە پێشتر پرسیان پێدەکرا و فەرمانی ئەوان بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکان بەگرنگ لەقەڵەم دەدرا و کەمێك رێزیان مابوو بەڵام لەرۆژگاری مۆعیزئەلدەولە ئەمانە بەگشتی لەناوچوون تا ئەو جێگەی خەلیفە چیتر وەزیریشی نەبوو. تەنیا دەبیرێکیان بۆ دانا کەکاروباری زەوییەکان و ژمێریاری لەئەستۆدا بوو. وەزارەت لەدەستی مۆعیزئەلدەولە و خۆی وەزیری بۆ خۆی هەڵدەبژارد.

لەگەورەترین خاڵە لاوازەکان لەفەرمانڕەوایی عەباسییەکان ئەوە بوو

دەیلەمییەکان، شیعەی توندڕەو بوون و باوەڕیان وابوو منداڵەکانی عەباس بەزۆر دەستیان بەسەر خەلافەتدا گرتووە یا بەوتەیەکی دیکە خەلافەتیان لەکەسە شیاوەکان دزیوە و بەم پێیە هۆکاری دینییان لەخۆیاندا نەدەبینی تا ملکەچی خۆیان نیشان بدەن تا ئەو جێگەی ئاگادار بوومەوە (کوڕی ئەسیر) مۆعیزئەلدەولە لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی راوێژی کرد بۆ ئەوەی خەلافەتی منداڵەکانی عەباس بەتەواوی لەناو ببات و بەیعەت لەگەڵ مۆعیزئەلدەولەی عەلەوی یا یەکێکی دیکە لەعەلەوییەکان ببەستن. کەسانی دەوروبەر رازی بوون جگە لەیەکیان کەوتی: ئەم بۆچوونێکی پەسند نییە چوونکە ئەمڕۆ لەگەڵ خەلیفەیت و لەگەڵ هاوەڵانت باوەڕتان وایە شیاوی خەلافەت نییە و ئەگەر فەرمانی کوشتنی ئەو بدەیت، دەیکوژن و رشتنی خوێنی بەڕەوا دەزانن بەڵام ئەگەر یەکێك لەعەلەوییەکان بکەیتە خەلیفە، تۆ و هاوەڵانت ئەو بەشیاو دەزانن و ئەگەر خەلیفە فەرمانی کوشتنی تۆ بەهاوەڵانت بدات، ئەو کارە دەکەن. مۆعیزئەلدەولە لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە. ئەمە یەکێك لەگەورەترین هۆکارەکانی رووخانی فەرمانڕەوایی منداڵەکانی عەباس لەگەڵ دنیاپەرەستی و خۆپەسەندی خەلیفەکانی ئەوان بوو.

مۆعیزئەلدەولە دەستی بەسەر هەموو عێراقدا گرت. هیچ شتێك لەدەستی خەلیفەدا نەبوو جگە لەچەند پارچە زەوییەك کەمۆعیزئەلدەولە پێی دابوو تا نیازەکانی خۆی پێ دابین بکات.

## جەنگی ناسرەئەلدەولە لەگەڵ مۆعیزئەلدەولە

لەرەجەب/ فەرویەی ئەم ساڵە مۆعیزئەلدەولە سوپایەکی بەفەرماندەیی موسا فیادە (ئەگەری هەیە پیادە) و یەنالی کوشە بەرەو موسڵ ڕەوانە کرد. کاتێك ئەم سوپایە گەیشتە عوکبرا، یەنالی کوشە تەنگی بەموسای فیادە هەڵچنی و ئوردووگاکەی تالان کرد و لەگەڵ سوپاکەی بۆ هێرش کردنە سەر ناسرئەلدەولە بەرێکەوت. ناسر لەو کاتەدا هێرشی کردبووە سەر عێراق و لەشەعبان/ مارس گەیشتە سامەرا و لەنێوان سوپاکەی و سوپای مۆعیزئەلدەولە لەعوکبرا جەنگ روویدا.

لەرەمەزان/ ئاوریل مۆعیزئەلدەولە لەگەڵ خەلیفە موتیع هێرشیان کردە سەر عوکبرا و کاتێك لەبەغداد ڕۆشتەدەر، کوڕی شێرزاد پەیوەستی ناسرئەلدەولە بوو و لەگەڵ سوپاکەی ئەو بۆ بەغداد گەڕایەوە و شارەکەیان خستە ژێر فەرمانی خۆیانەوە. کوڕی شێرزاد بەنوێنەرایەتی ناسرئەلدەولە کاروبارەکانی بەغدادی هەڵدەسووڕاند و ناسرئەلدەولە خۆی بەجەنگ دژی مۆعیزئەلدەولە سەرقاڵ بوو. لەدەی رەمەزان/ شانزەی ئاوریل، ناسرئەلدەولە لەسامەراوە بەرەو بەغداد ڕۆشت و لەوێ مایەوە. کاتێك مۆعیزئەلدەولە ئەم هەواڵەی بیست، هێرشی کردە سەر تکریت و تالانی کرد چوونکە ئەم شارە لەژێر فەرمانی ناسرئەلدەولەدا بوو. دواتر لەگەڵ خەلیفە بەرەو بەغداد بەرێکەوت و لەبەشی رۆژئاوای شارەکە ئوردووی لێدا. ناسرئەلدەولە لەبەشی رۆژهەڵات بوو. لەبەغداد بەناوی خەلیفە موتیع وتار نەدەخوێنرایەوە. دواتر جەنگ لەنێوان ئەو دوو سوپایە دەستی پێکرد.

عەرەبە دەشتەکییەکانی سوپای ناسرئەلدەولە خۆیان گەیاندە بەشی رۆژئاوا و رێگەیان نەدا خواردەمەنی و ئالیك بەسوپاکەی مۆعیزئەلدەولە بگات. لەناو دەیلەمییەکان گرانییەکی ئەوتۆ هاتە ئاراوە کەنرخی یەك نان بۆ یەك درهەم و چوار درهەم بەرز بوویەوە بەلام هێشتا هەرزانی و فراوانی لەناو سوپاکەی ناسرئەلدەولە دەبینرا و لەموسڵ و لەرێگەی دیجلەوە خواردن و ئالیکی پێدەگەیشت. بەهای پێنج رەتڵ نان لەناو سوپاکەی ناسرئەلدەولە لەیەك درهەم زیاتر نەبوو.

ناسرئەلدەولە ئاڵ و وێری بەو سکانەی ناوی موتیعی لەسەر هەڵکەندرابوو، یاساغ کرد و درهەم و دینارەکانی ساڵی ٩٤٢/٣٣١ زایینی کەناوی موتەقی لەسەر هەڵکەنرابوو، بەکار برد. کوڕی شێرزاد بۆ جەنگی مۆعیزئەلدەولە لەبەهادوران و خەڵکی گەڕەك و کۆڵانەکان هاوکاری کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان لەئاو پەڕینەوە و جەنگیان دژی دەیلەمییەکان دەست پێکرد.

لەیەکێك لەشەوەکان ناسرئەلدەولە لەگەڵ هەزار سەرباز بۆ سەرکوت کردنی مۆعیزئەلدەله لەدیجلە پەڕییەوە. ئیسپەهدوست یەکێك لەبوێرترینی خەڵکان بوو. بارودۆخ بەرادەیەك بۆ سوپاکەی مۆعیزئەلدەولە دژوار بوو کەمەبەستی گەڕانەوە

بۆ ئەهوازی کرد. وتی: فریویك بەکار دەبەین، ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست هێنا چ باشتر و جیاواز لەوە بۆ ئەهواز دەگەڕێینەوە. ئەو گوزەرەکانی سەمارینی رێکخست و فەرمانی بەوەزیرەکەی باوکی جەعفەری سەیمەری و ئیسپەهدوستدا بەرێکەوەن و خۆی لەگەڵ سوپاکەی وای نیشاندا مەبەستی گوزەر کردن لەقوتەربولیان هەیە. مۆعیزئەلدەولە شەوانە بەرێکەوت و مەشخەڵەکانی لەکەنار رووباری دیجلە هەڵکرد. زۆربەی سوپاکەی ناسرئەلدەولە رووبەرووی ئەوان دەرۆشتن تا رێگەی پەڕینەوەیان لێ بگرن. بەم شێوەیە سەیمەری و ئیسپەهدوست توانییان لەرووبار بپەڕنەوە. سوپاکەیان بەدوای ئەوان لەرووبار پەڕییەوە.

کاتێك مۆعیزئەلدەولە لەپەڕینەوەی هاوەڵانی ئاگادار بوویەوە، بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە و دوژمن هەستی بەفێڵەکەی کرد. یەنالی کوشە لەگەڵ ژمارەیەك لەسوپاییەکانی ناسرئەلدەولە رووبەروویان بوونەوە بەڵام هەڵاتن و سوپاکەی ناسرئەلدەولە شڵەژا و دەیلەمییەکان دەستیان بەسەر بەشی رۆژهەڵات گرت و خەلیفە لەموحەرەمی ٣٣٥/ ئۆگۆستی ٩٤٦ زایینی بۆ کۆشکەکەی خۆی گەڕایەوە. دەیلەمییەکان سامانی دانیشتووانی بەغدادیان تالان کرد کەبریتی بوو لەدەهەزار هەزار دینار. مۆعیزئەلدەولە فەرمانی پێدان دەست لەکوشت وکوشتار هەڵگرن و ئەمانی بەخەڵکان بەخشی بەڵام تالانچییەکان دەستیان لەتالان کردن هەڵنەگرت. مۆعیزئەلدەولە فەرمانی بەسەیمەری وەزیردا جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست و سەرپێچیکەران بکوژێت و لەچوارمێخەیان بدات. خۆی بەئەسپ لەناو شارەکە سووڕایەوە تا رێگە لەم بارودۆخ و تالانکارییە بگرێت.

مۆعیزئەلدەولە لەبەغداد نیشتەجێ بوو. ناسرئەلدەولە لەعوکبرا مایەوە و بێ راوێژ کردن بەتورکە تەوزونییەکان پەیکی ئاشتی بۆ لای مۆعیزئەلدەولە نارد. تورکەکان مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد و ئەو بەخێرایی بەرەو موسڵ هەڵات و لەموحرەمی ٣٣٥/ئۆگۆستی ٩٤٦ زایینی ئاشتی لەنێوان ئەو دووانە سەقامگیر کرا.

## مەرگی قـائیم و فەرمانڕەوای مەنسور

لەسیانزەی شەوال/ نۆزدەی مەی ئەم ساڵە قائیم بـامرالله بـاوکی قاسم محەممەد کوڕی عەبدوللە مەهدی عەلەوی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە مرد و ئیسماعیلی کوڕی دوای خۆی بەنازناوی مەنسور بالله هاتە سەرکار و لەترسی باوکی یەزید، مەرگی بـاوکی بـەنهێنی هێشتەوە. بـاوکی یەزیـد لـەنزیك ئـەو و لەسوسـە ژیـانی بەسـەر دەبرد. مەنسور بارودۆخی بەهەمان شێوە هێشتەوە و خۆی بەخەلیفە ناو نەبرد. ئەو نەگۆڕانکاری لەدرهەم و دینارەکان کرد و نەبەناوی خۆی وتاری خوێندەوە و لەلەهێمای سەر ئاڵاکان گۆڕانکاری دروست کرد. هەموو شتێك مایـەوە تـا بـاوکی یەزید لەناوچوو. دوای مەرگی ئەو، پەردەی لەسەر مردنی بـاوکی خۆی هـەڵگرت و نـاوی خەلیفـەی لـەخۆی نـا و کەشتی و کەرەسـتەکانی جـەنگی دروست کـرد. ئـەو پیـاوێکی بوێر و ئـازا بوو. وڵات و دەسەڵاتی خستە ژێر فـەرمانی خۆی. شیاوتر بـوو مـەرگی قـائیم و فەرمانڕەوایـەتی مەنـسور پێـشتر ئامـاژەی پێبـدرێت بـەڵام درەنگـتر ئاماژەمـان پێـدا و بـەم کورتـە باسـە بەسـەندەمان کـرد تـا رووداوەکـانی تایبەت بەباوکی یەزید پچرانی تێنەکەوێت.

## چۆنیەتی لەت لەت بوونی وڵات و خاپوور بوونی

لەم ساڵەدا سوپای دژی مۆعیزئەلدەولە کوڕی بویە شۆڕشی کرد و سـوپاییەکان جوێنیـان پێـدا. مۆعیزئەلدەولـە بەڵێنیـدا لـەزەمانێکی دیـاریکراو مانگانـەی سوپاییەکان بدات. لەبەر ئەمە ناچار بوو خەڵکان سـەرکوت و بـەزۆر دەست بەسـەر سامانی ئەواندا بگرێت و هـەموو ئاوەدانییـەکانی حکومـەت و زەوییـەکانی تایبـەت بەخۆی لەناو سەرکردە و هاوەڵانی بلاو ببەخشێتەوە. بەم شێوەیە دەرگای زۆربەی دیوانەکان داخران و دەستی کارگوزارەکان کورت کرایەوە و وڵات لەبەر ناسازگاری و گرانـی و تاڵانکـاری بـەرەو وێـران بـوون و کـەرت بـوون دەڕۆشـت. سـەرکردەکان دەسـتیان بەسـەر ئاوەدانییەکانـدا گـرت و ئـەم گوندانـە لـەجاران زیـاتر ئـاوەدان بوونەوە و لەبەر دەسەڵات خوازی ئەم سەرکردانە داهاتی ئەوان زیادی کرد و چیتر

مۆعیزئەلدەولە نەیدەتوانی ئەم ئاوەدانییانە لەدەست ئەوان دەربێنێت. بەڵام ئەو شوێنە جیاوازەکانی دیکە کەدەستیان بەسەردا گرت، زیاتر لەجاران وێران بوو. گوندە وێرانەکانیان رادەست کردەوە و لەبەرابەردا گوندە ئاوەدانەکانیان هەڵگرت. سەربازەکان هیچیان بەگوندە وێرانەکان نەدا و ئاو و رێگەکانیان پشتگوێ خست. دەرئەنجام ئەم گوندانە وێران و لەناوچوون.

خاوەن زەوییەکانیش ستەمکاری و زۆرداریان کردە پیشە و هەرکەس نەیدەتوانی بەرهەم بەدەست بێنێت، دەستی بەسەر سامانی وەرزێرەکاندا دەگرت. مۆعیزئەلدەولە هەرکام لەم شوێنانەی بەیەکێك لەسەرکردەکانی خۆی دەبەخشی تا پارێزگاری لێ بکەن. ئەو سەرکردەیش ئەو ناوچەی دەکردە ژینگەی خۆی و براکانی لەدەوری کۆدەبوونەوە. ئەم سەرکردانە بۆ نەدانی باج رایاندەگەیاند لەبەرهەمە کشتوکاڵییەکان نەداهاتیان دەست کەوتووە بەڵکو زیانیشان کردووە چوونکە ئەگەر کەسێك رەخنەی لێدەگرتن پەیوەستی دوژمنان دەبوون، بەمشێوە پشتگوێ دەخران و تەماحی سەرکردەکان زیادی دەکرد و بۆ تەماحەکەی خۆیان هیچ سنوورێکیان نەدەناسی. بەم شێوەیە بارودۆخ بۆ مۆعیزئەلدەولە دژوار و نەیتوانی بۆ رۆژی تەنگانە سامانی پێویست کۆبکاتەوە. ئەو لەسپاردنی زەوییەکان بەکۆیلە تورکەکان زێدەرۆیی کرد، لەبەر ئەمە دەیلەمییەکان رژدیان پێبردن و دەرئەنجام دوژمنایەتی و دووبەرەکی هاتە ئاراوە و دواتر بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین.

## مەرگی ئەخشید و فەرمانڕەوایی سەیف ئەلدەولە لەدیمەشق

لەزیحەججە/ ژوئییەی ئەم ساڵە ئەخشید ئەبوبەکر محەممەد کوڕی توغج، فەرمانڕەوای میسر، مرد. ئەو لەساڵی ٨٨١/٢٦٨ زایینی لەبەغداد چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەدیمەشق مرد. دەستەیەك مەرگی ئەو بۆ ساڵی ٩٤٦/٣٣٥ زایینی دەگێڕنەوە. دوای خۆی کوڕەکەی باوکی قاسم ئەنەوجور (ئەبوجور، باوکی جەور) هاتە سەرکار. کاتێك ئەنەوجور هاتە سەرکار، کافوره رەش، یەکێك لەکۆیلەکانی باوکی وەك وەزیر دەستنیشان کرد. کافور کاتێك بینی گەورەی بۆ بەرێوەبردنی

کارەکـان ناتەوانـە، جڵـەوی کاروبارەکـانی گرتەدەسـت. ئـەم کـافورە ئەوکەسـەیە موتەنبی سەرەتا وەسفی کرد بەڵام دواتر سەرکۆنەی کرد.

بـاوکی قاسـم گـەنجێك بـوو، کـافور هاوشـێوەی بـاوکی بـوو، لەبـەر ئەمـە ئـەوی بەناتەوان دەزانی و خستییە ژێر فەرمانی خۆیەوە. ئەو کاتەی کافور بەرەو میسر بەرێکەوت، سـەیف ئەلدەولـە مەبەسـتی هێـرش کردنـە سـەر دیمەشـقی کـرد و ئـەو شارەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و لەویێ مایەوە. رۆژێك سەیف ئەلدەولە لەگەڵ شەریفی عەقیلی لەدەوروبەری دیمەشق دەسوڕایەوە، بەشەریفی وت: ئایا ناوچە ئاوەدانەکان تەنیا بۆ یەك کەس شیاوە. عەقیلی وتی: بەڵام ئەمە سەرزەمینی تیرە و هـۆزە جیاوازەکانـە. سـەیف ئەلدەولـە وتـی: ئەگـەر یاسـا دەوڵەتییـەکان دەسـت بەسەر ئەم سەرزەمینەدا بگرن، هەموو تیرە و هۆزەکان شارەکە بەجێدێڵن. عـەقیلی دانیـشتووانی دیمەشـقی لـەم وتەیـە ئاگـادار کـردەوە و ئـەوان نامـەیان بـۆ کـافور نووسـی و داوایـان لێکـرد بەپەلـە خـۆی بگـەیێنێت. کـافور بەرێکـەوێت و خـەڵکی دیمەشق لەساڵی ٩٤٧/٣٣٦ زایینی، سەیف ئەلدەولـەیان دەرپەڕانـد و ئەنـەوجور شان بەشانی کافور تا حەلـەب شـوێنپێی سـەیف ئەلدەولـەیان هـەڵگرت. ئەنـەوجور لەحەلـەب مایـەوە و سـەرئەنجام لـەنێوان ئـەو و سـەیف ئەلدەولـە پـەیمانی ئاشـتی سەقامگیر کرا و ئەنەوجور بۆ میسر گەڕایەوە و سەیف ئەلدەولە بۆ حەلـەب. کـافور بـۆ ماوەیـەك لەدیمەشـق مایـەوە، دواتـر بـەدری ئەخـشیدی ناسـراو بـەبودەیر وەك فـەرمانڕەوای شـارەکە دەستنیـشان کـرد و خـۆی ڕێگـەی میـسری گرتەبـەر. بـودەیر یەك ساڵ لەدیمەشـق مایـەوە و دواتـر بـاوکی موزەفـەر کـوڕی تـوغج دەسـتی بەسـەر دیمەشقدا گرت و بودەیری قۆڵبەست کرد.

## ناسازگاری باوکی عەلی لەگەڵ ئەمیر نوح

لـەم ساڵەدا بـاوکی عـەلی کـوڕی موحتـاج ڕێگـەی ناسـازگاری لەگـەڵ ئـەمیر نـوح، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهری گرتەبەر.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك باوکی عەلی لەمەرو بۆ نەیشابور گەڕایەوە و بـۆ ڕۆشـتن بـۆ ڕەی سـوپای رازانـدەوە، ئـەمیر نـوح چـاودێرێکی نـارد تـا بـەناو

سوپاکەدا بگەڕێت. ئەم چاودێرە بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ سوپاییەکان کرد و لەرۆژانەی ئەوانی کەم کردەوە. سەربازەکان لێی بێزار بوون و بەبێزارییەوە بەرێکەوتن، جیاواز لەوە نوح بۆ بەرێوەبردنی کاروباری تایبەت بەسوپا کەسێکی لەگەڵ ناردن و هەموو شتێکی بەو سپاردبوو لەکاتێکدا لەرۆژگاری نەسر کوڕی ئەحمەد کارەکان لەدەستی باوکی عەلیدا بوو. باوکی عەلی ڕەنجا. جیاواز لەوە فەرمانڕەوایەتی خوراسانی لێسەندرایەوە و وەك ئامارژەمان پێدا ئیبراهیم کوڕی سیمجور جێگەی ئەوی گرتەوە. ئۆدەداری کاروباری دیوانی لەشکری لەهەڵس و کەوت و دابین کردنی نیازەکان و پێدانی رۆژانەی سوپا بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ سوپاییەکان دەکرد و ئەمە زیاتر بووە هۆی بێزار بوونی ئەوان. لای یەکتر زمانیان بۆ سکالاً کردەوە. لەم کاتەدا گەیشتبوونە هەمەدان. بڕیاریاندا نامە بۆ ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل، مامی نوح، بنوسن و ئەو بۆ لای خۆیان بانگ بکەن و بەیعەتی لەگەڵ ببەستن و وڵات بخەنە ژێر فەرمانی ئەو. ئیبراهیم لەو کاتەدا لەموسڵ و لەخزمەتی ناسرئەلدەولەدا بوو. پێشتر ئامارژەمان بەچۆنیەتی ڕۆشتنی ئەو بۆ موسڵدا.

کاتێك سوپا مەبەستی ئەنجامدانی ئەم کارەی کرد، باوکی عەلییان ئاگادار کردەوە. باوکی عەلی ڕێگەی ئەم کارەی لێگرتن بەڵام سوپاییەکان هەڕەشەیان کرد ئەگەر ڕەزامەندی خۆی نیشان نەدات، دەیگرن و زیندانی دەکەن. باوکی عەلی بەناچاری رازی بوو. ئەوان نامەیان بۆ ئیبراهیم نووسی و لەبارودۆخی خۆیان ئاگاداریان کردەوە. ئیبراهیم لەگەڵ نەوەد شاسوار بۆ پەیوەست بوون بەوان بەرێکەوت و لەرەمەزان/ ئاوریلی ئەم ساڵە پەیوەستیان بوو. باوکی عەلی لەهەمەدان چاوی پێیکەوت و سوپا لەشەوال/ مەی لەگەڵ ئەو بەرەو ڕەی بەرێکەوت. کاتێك گەیشتنە ڕەی، باوکی عەلی ئاگادار بوویەوە کەبراکەی فەزڵ، نامەیەکی بۆ ئەمیر نوح نووسیوە وئەوی لەمەبەستی ئەوان ئاگادار کردۆتەوە. لەبەر ئەمە براکەی خۆی و بەرێوەبەردی دیوانی قۆڵبەست کرد و بەرەو نەیشابور بەرێکەوت و کارگوزارەکانی خۆی لەڕەی و چیاکان دانا.

ئەمیر نوح ئاگادار بوویەوە. ئەو سوپاکەی ئامادە کرد و لەبوخارا بەرەو مەرو

بەرێکەوت. سوپاییەکان لە محەممەد کوڕی ئەحمەد، هەڵسوڕێنەری کاروبارەکان بێزار ببوون، بەنوحیان وت: ئەم کارگوزارەی تۆ، کاروبارەکانی لەخوراسان شێواندووە و باوکی عەلی بۆ سەرکێشی و سەرپێچی هانداوە و سوپاییەکانی تۆراندووە. داوایان لێکرد ئەوتەسلیم بکات وگەرنە پەیوەستی ئیبراهیمی مامی و باوکی عەلی دەبن. نوح، محەممەد کوڕی ئەحمەدی بەوان سپارد و ئەوان لەجومادی الاوەلی ۳۳۵/ نۆڤەمبەری ٩٤٦ زایینی کوشتیان.

کاتێك باوکی عەلی گەیشتە نەیشابور، بینی ئیبراهیم کوڕی سیمجور و مەنسور کوڕی قەراتکین و سەرکردەکانی دیکە دەستیان بەسەر دا گرتووە. باوکی عەلی رێزی لەو دووانە گرت و ئەوان پەیوەستی بوون و لەموحرەمی ۳۳۵/ ئۆگۆستی ٩٤٦ زایینی ڕۆشتنە نەیشابور. لەم کاتەدا باوکی عەلی هەستی بەخراپەکاری مەنسور کرد و ئەوی خستە زیندانەوە.

باوکی عەلی و ئیبراهیم لەرەبیع الاوەلی ۳۳۵/سێپتامبەری ٩٤٦ لەنەیشابورەوە بەرەو مەرو بەرێکەوتن. مەرو لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی ئەمیر نوحدا بوو و فەزڵ، برای باوکی عەلی، لەزیندان هەڵاتبوو. فەزڵ زیندانوانەکانی فریودا و بەرەو قوهستان هەڵات و لەوێ مایەوە. باوکی عەلی بەرەو مەرو بەرێکەوت. کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە، ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکانی نوح پەیوەستی بوون. نوح لەمەرو بەرەو بوخارا هەڵات و باوکی عەلی لەجومادی الاوەلی ۳۳۵/ نۆڤەمبەری ٩٤٦ زایینی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و چەند رۆژێك لەوێ مایەوە و زۆرینەی سوپاکەی نوح پەیوەستی بوون. ئەو بەرەو بوخارا بەرێکەوت و رووباری ئەو شارەی بڕی. نوح لەبوخاراوە بەرەو سەمەرقەند هەڵات و باوکی عەلی لەجومادی الاخرەی ۳۳۵/ دێسامبەری ٩٤٦ زایینی ڕۆشتە بوخارا و بەناوی ئیبراهیمی مامی نوح وتاری خوێندەوە و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

لەم کاتەدا باوکی عەلی لەخراپەخوازی ئیبراهیم ئاگادار بوویەوە و ئەوی بەجێهێشت و بەرەو تورکستان بەرێکەوت. ئیبراهیم لەبوخارا مایەوە. لەم ناوەدا باوکی عەلی، مەنسور کوڕی قەراتیکی لەزیندان ئازاد کرد و ئەو پەیوەستی ئەمیر نوح بوو.

ئیبراهیم بەشێوەیەکی نهێنی لەگەڵ دەستەیەك یەکی گرت تا لەفەرمانڕەوایەتی دەست بکێشێتەوە و جارێکی دیکە کاروبارەکان بخاتە ژێر دەستی برازاکەی، ئەمیر نوح و خۆی ببێتە فەرماندەی سوپاکەی. هەردووك بۆ سەرکوت کردنی باوکی عەلی بڕیاریاندا. ئیبراهیم داوای هاوکاری لەدانیشتووانی بوخارا کرد و دانیشتووانی ئەو شارە رازی بوون و هێرشیان کردە سەر باوکی عەلی کەهاوەڵەکانی لێی جیابوونەوە. باوکی عەلی لەگەڵ دەستەیەك هێرشی کردە سەریان و بەریسواترین شێوە ئەوانی بۆ بوخارا گەڕاندەوە و ویستی شارەکە بسووتێنێت بەڵام پیرانی بوخارا نێوەنجیگەرییان کرد و ئەو لێیان خۆش بوو و بۆ شوێنەکەی گەڕایەوە و باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی نەسر کوڕی ئەحمەد، برای ئەمیر نوحی بۆ لای خۆی بانگ کرد وەك فەرمانڕەوا هەڵیبژارد و بەیعەتی لەگەڵ بەست و لەسەرزەمینەکانی ژێر دەستی بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە.

لەم کاتەدا خراپەکاری و خراپەخوازی ژمارەیەك لەسوپاییەکانی ئاشکرا بوو. ئەو کاروبارەکانی باوکی جەعفەری رێکخست و ئەوەی پێویستی بوو، کۆی کردەوە و لەشارەکە دوور کەوتەوە وەك بڵێی مەبەستی سەمەرقەندی لەسەردایە بەڵام دەیویست هێرش بکاتە سەر سەغانییەکان و لەوێوە رێگەی نەسەف بگرێتەبەر. کاتێك لەشارەکە هاتەدەر، دەستەیەك لەسوپاییەکان و کەسانی دەوروبەری بۆ بوخارا گەڕاندەوە و نامەی بۆ نوح نووسی کەبوخارای پشتگوێ خستووە.

باوکی عەلی لەشەعبان/ مارس بەرەو سەغانییان بەرێکەوت. کاتێك لەبوخارا ڕۆشتەدەر، ئیبراهیم و باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی نەسر بەرەو سەمەرقەند ڕۆشتن و داوای ئەمانیان لەنوح کرد و لەکردەوەکانیان پەشیمان بوونەوە. نوح ئەوانی لەخۆی نزیك کردەوە و بەڵێنی چاکەی پێدان و لەرەمەزان/ ئاوریل بۆ بوخارا گەڕایەوە. لەم ڕۆژانەدا نوح تەغانی پەردەداری کوشت و ئیبراهیمی مامی لەگەڵ دوو براکەی خۆی باوکی جەعفەر محەممەد و ئەحمەدی کوێر کرد. سوپاییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و پەرێشانی لەناو سوپاکەیدا نەما.

بەڵام فەزڵ کوڕی محەممەد برای باوکی عەلی -وەك ئاماژەی پێدرا- لەدەست

براکەی رزگاری بوو و لەقوهستان نیشتەجێ و ژمارەیەکی زۆری لەدەوری خۆی کۆکردەوە و بەرەو نەیشابور بەرێکەوت. نەیشابور لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی محەممەد کوڕی عەبد رەزاقدا بوو کە بەنوێنەرایەتی باوکی عەلی کاروبارەکانی ئەو شارەی هەڵدەسووڕاند. محەممەد بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و فەزڵ و سوارێکی دیکە هەڵاتن. ئەو خۆی گەیاندە بوخارا و ئەمیر نوح رێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. ئەو لای ئەمیر نوح مایەوە.

## دانانی مەنسور کوڕی قەراتکین وەك فەرمانڕەوای خوراسان

کاتێك ئەمیر نوح بۆ بوخارا گەڕایەوە و کاروبارەکانی وڵاتی رێکخست و باوکی عەلی لەسەغانییان و باوکی ئەحمەد محەممەد کوڕی عەلی قەزوێنی فەرمانڕەوایەتی مەروی دەکرد بەباشی زانی مەنسور کوڕی قەراتکین وەك سەرکردەی سوپای خوراسان دیاری بکات. ئەوی کردە فەرماندەی سوپا و بۆ مەرو ڕەوانەی کرد کە لەژێر فەرمانی باوکی ئەحمەددا بوو. ئەو سەرچاوەکانی نێوان ئامول و مەروی هەڵکەندبوو. سەرەتا پەیوەستی باوکی عەلی بوو بەڵام دواتر لێی جیابوویەوە.

مەنسور لەگەڵ دووسەد سوار بەخێرایی هێرشی کردە سەری و قەزوێنی کاتێك هاتەخۆی کەمەنسور لەکوشماهین لەپێنج فەرسەنگی مەرو ئوردووی لێدابوو. مەنسور دەستی بەسەر مەرودا گرت و باوکی ئەحمەد بەرەو پیری ڕۆشت و رێزی لێگرت. ئەویش باوکی ئەحمەد و سامان و کەس و کارەکەی بۆ بوخارا ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتە بوخارا، ئەمیر نوح رێزی گرت بەڵام پاسەوانی بۆ دانا. لەیەکێك لەرۆژەکان ئەمیر نوح نامەیەکی لەقەزوێنی گرت کە بەناخۆشی زانی. ئەوی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد، سەرەتا سەرکۆنە و دواتر کوشتی.

## سازانی باوکی عەلی و ئەمیر نوح

باوکی عەلی لەسەغانییان مابوویەوە. بیستی باوکی نوح دەیەوێت سوپاکەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە بکات، لەبەر ئەمە سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و بەرەو بەلْخ بەرێکەوت و لەوێ مایەوە. نێردەی ئەمیر نوح گەیشتە لای و پەیامی سازان و ئاشتی نوحی پێ ڕاگەیاند. باوکی عەلی ڕازی بوو بەلاّم ژمارەیەك لەسەرکردەکانی نوح کەپەیوەستی باوکی عەلی ببوون، ڕازی نەبوون و وتیان: ئەگەر مەبەستی سازان و ئاشتیت لەسەردایە، شیاوە ئێمە بۆماڵەکانمان بگەڕێنیتەوە.

باوکی عەلی بەرەو بوخارا بەرێکەوت و ئەمیر نوح لەگەڵ سوپاکەی هێرشی کردەسەر. فەزڵ کوڕی محەممەد، برای باوکی عەلی وەك فەرماندەی سوپاکەی دەستنیشان کرد. دوو سوپا لەجومادی الاوەلی ٣٣٦/ نۆڤەمبەری ٩٤٧ زایینی دەستیان بۆ شمشێر برد و کەمێك پێش ئێواریْ جەنگیان دەست پێکرد. لەم کاتەدا ئیسماعیل کوڕی حەسەنی داعی داوای ئەمانی لەنوح کرد و بەم شێوەیە سوپاکەی باوکی عەلی شڵەژا و باوکی عەلی هەلاّت و بۆ سەغانییەکان گەڕایەوە.

دواتر باوکی عەلی ئاگادار بوویەوە سوپاکەی ئەمیر نوح لەبوخارا و بەلْخ و شارەکانی دیکە دەیانەوێت هێرشی بکەنەسەر بەلاّم ئەمیر خوتەل، سوپای بۆ هاوکاری کردنی باوکی عەلی ئامادە کرد. باوکی عەلی لەگەڵ سوپاکەی بەرەو تەرموز بەرێکەوت و کاتێك لەجەیحون پەڕییەوە و ڕۆشتە بەلْخ و لەویْ ئوردووی لێدا، دەستی بەسەر بەلْخ و تەخارستاندا گرت و باجی ئەم سەرزەمینانەی بۆ خۆی کۆکردەوە.

لەبوخاراوە سوپایەکی گەورە بەرەو سەغانییان بەرێکەوت. ئەم سوپایە کەفەزڵ کوڕی محەممەد، برای باوکی عەلی، فەرماندەی بوو، لەنەسەف ئوردووی لێدا. ژمارەیەك لەسەرکردەکانی سوپا نامەیان بۆ ئەمیر نوح نووسی و فەزڵیان بەوە تۆمەتبار کرد کەخوازیارە پەیوەستی براکەی ببێت. نوح فەرمانی گرتنی ئەویدا. ئەویان گرت و ڕەوانەی بوخارایان کرد.

ئەم هەواڵە بەباوکی عەلی لەتەخارستان گەیشت و ئەو بۆ سەغانییان گەڕایەوە و لەنێوان ئەم دوو سوپایە چەندین جەنگ روویدا. باوکی عەلی ڕێگەی گەیشتنی

ئالیکی لەسوپاکەی نوح گرت. سوپای ئەمیر نوح بەناچاری رووی کردە گوندێکی دیکە لەدوو فەرسەخی سەغانییان. باوکی عەلی دووبارە جەنگی دەست پێکردەوە و لەرەبیع الاوەلی ٣٣٧/ سێپتامبەری ٩٤٨ زایینی ئاگری جەنگێکی قورسی لەگەڵ ئەوان هەڵگیرساند. بەڵام سوپاکەی نوح پاشەکشێی بەباوکی عەلی کرد. ئەو بەناچاری رێگەی شومانی گرتەبەر. ئەم ئاوەدانییە لەشانزە فەرسەخی سەغانییان بوو. سوپاکەی نوح رۆشتە سەغانییان و کۆشك و ماڵەکانی باوکی عەلی وێران کرد و شوێنی پێی هەڵگرت. باوکی عەلی بۆ جەنگی ئەوان گەڕایەوە و سوپاییەکان لەدەوری کۆبوونەوە. باوکی عەلی بارودۆخی لەسوپاکەی نوح دژوار کرد و رێگەکانی بەست و چیتر نەهەواڵیان لەبوخارا پێدەگەیشت نەهەواڵی ئەوان بەبوخارا. ئەم بارودۆخە بیست رۆژ درێژەی کێشا. لەم کاتەدا سەربازەکانی نوح، پەیامیان بۆ باوکی عەلی نارد و خوازیاری ئاشتی بوون. باوکی عەلی رازی بوو. بڕیاریاندا باوکی عەلی، موزەفەری کوڕی وەك بارمتە بۆ لای ئەمیر نوح رەوانە بکات و بەم شێوەیە لەجومادی الاخرەی ٣٣٧ زایینی/ دێسامبەری ٩٤٨ زایینی، پەیمانی ئاشتی واژۆ کرا.

باوکی عەلی فەرمانیدا کوڕەکەی بۆ بوخارا ببەن. نوح فەرمانیدا پێشوازی لێ بکەن. نوح، رێزی لەکوڕەکەی باوکی عەلی گرت. باوکی موزەفەر عەمامە لەسەر هاتە لای نوح، بەڵام نوح کڵاوێکی پێبەخشی و ئەوی کردە هاونشینی خۆی. ناسازگاری نێوان نوح و باوکی عەلی کۆتایی پێهات.

شیاو بوو ئەم رووداوانە لەساڵی روودانیان ئاماژەی پێبدرێت بەڵام لەم ساڵەدا باسمان کرد تا پچڕانیان تێ نەکەوێت.

گێڕانەوەی ئەم رووداوانە بەپێی گێڕانەوەی مێژوونووسانی خوراسانە لەکاتێکدا عێراقییەکان گێڕانەوەیەکی دیکەیان بۆ ئەم رووداوانە هەیە و ئێمە لێرەدا بەشێوەیەکی کورت ئاماژەی پێدەدەین. ئەوان دەڵێن:

کاتێك باوکی عەلی لەگەڵ سوپای خوراسان رێگەی شاری رەی گرتەبەر، رۆکن ئەلدەولە نامەیەکی بۆ عیماد ئەلدەولەی برای نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. عەبدوللە وەڵامی بۆ نارد تا رەی پشتگوێ بخات و پەیوەستی خۆی بێت بۆ ئەوەی

بیر لەرێگە چارەیەك بکەنەوە. ڕۆکن ئەلدەولە ئەو کارەی کرد.

باوکی عەلی ڕۆشتە ڕەی. عیماد ئەلدەولە بەشێوەیەکی نهێنی نامەیەکی بۆ نوح نووسی و بەڵێنیدا ساڵانە سەد هەزار دینار زیاتر لەوەی باوکی عەلی ڕەوانەی دەکات، بنێرێت و باجی یەك ساڵ لەپێشەوە بدات و ڕەزامەندی نیشاندا بۆ زاڵبوون بەسەر باوکی عەلی، لەهیچ هاوکارییەك درێغی نەکات. عیماد ئەلدەولە، نوحی لەباوکی عەلی ترساند. نوح لەگەڵ کەسەکانی ڕاوێژی کرد. کەسانی دەوروبەری ڕژدییان بەباوکی عەلی دەبرد و ئەویان بەدوژمن لەقەڵەم دەدا. نوحیان بۆ ڕازی بوون بەپێشنیارەکەی عیماد ئەلدەولە هاندا. نوح کەسی بۆ لای عیماد ئەلدەولە نارد تا کاروبارەکانی بۆ ڕێکبخات و باجی یەك ساڵ بنێرێت. عیماد ئەلدەولە ڕێزی لەنێردەی نوح گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. لەلایەکی دیکە باوکی عەلی لەم پەیامە ئاگادار کردەوە و وتی هێشتا ڕێز لەپەیوەندی هاورێیەتی نێوان خۆی و ئەو (باوکی عەلی) دەگرێت و ئەوی لەفریوەکەی نوح ئاگادار کردەوە. باوکی عەلی نوێنەرێکی بۆ لای ئیبراهیم لەموسڵ نارد و داوای لێکرد فەرمانڕەوایەتی بگرێتەدەست. ئیبراهیم بەرێکەوت و باوکی عەلی لەهەمەدان ئەوی بینی و پێکەوە بەرەو خوراسان بەرێکەوتن.

عیماد ئەلدەولە نامەیەکی بۆ ڕۆکن ئەلدەولەی برای نووسی و فەرمانی پێدا بەخێرایی هێرش بکاتە سەر ڕەی. ڕۆکن ئەلدەولە ڕێگەی ئەوشارەی گرتەبەر بەڵام بارودۆخی خوراسان شێوا و عیماد ئەلدەولە، نوێنەرەکەی نوحی گەڕاندەوە بێ ئەوەی باجی پێبدات و پێی وت: دەترسم پارەت پێ بدەم و باوکی عەلی دەستی بەسەردا بگرێت. عیماد ئەلدەولە نێردەیەکی بۆ لای نوح نارد و لەمەترسییەکانی باوکی عەلی ئاگاداری کردەوە و بەڵێنی هاوکاری پێدا. لەلایەکی دیکە پەیکی بۆ لای باوکی عەلی نارد و بەڵێنی هاوکاری بەویشدا و پێشنیاری پێکرد بۆ جەنگ دژی نوح پەلە بکات. نوح هێرشی کرد و لەنەیشابور ڕووبەڕووی سوپاکەی باوکی عەلی بوویەوە و سەرئەنجام، نوح شکستی خوارد و بۆ سەمەرقەند گەڕایەوە و باوکی عەلی دەستی بەسەر بوخارادا گرت. باوکی عەلی لەئیبراهیم ترسا و لێی دوورکەوتەوە.

نـوح سـوپاکەی خـۆی کـۆکردەوە و بـۆ بوخـارا گەڕایـەوە و جـەنگی لەگـەڵ ئیبراهیمـی مـامی دەسـتپێکرد. کاتێـك دوو سـوپا ریزیـان بەسـت، دەسـتەیەك لەسەرکردەکانی ئیبراهیم پەیوەستی نووح بوون و ئەوانی دیکە هەڵاتن. ئیبراهیم ئەسیر کرا و نوح چاوی ئەو و دەستەیەکی دیکە لەکەسانی دەروبەری ئیبراهیمی دەرهێنا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لـەم سـاڵەدا مۆعیزئەلدەولـە و بـاوکی قـاسمی بورەیـدی پـەیمانی ئاشـتییان واژۆ کـرد و بـاوکی قاسـم بـەڵێنی ڕەوانـە کردنـی بـاجی واسـت و سـەرزەمینەکانی دەوروبەریدا.

لەم ساڵەدا گرانییەکی ئەوتۆ لەبەغداد هاتە ئاراوە کەخەڵکان، مردوو، سەگ و پـشیلەیان دەخـوارد. هەنـدێ کـات دەبینـرا منالێـك دەبـرژێنن و دەیخـۆن. دانیشتووانی ئەم شارە بەزۆری دڕکی خەروب(جۆرێك دڕکە)یان دەخوارد. ئەوان دەنـووی ئـەم دڕکـەیان دەکوڵانـد و دەیـانخوارد. بـەم شـێوەیە ژمارەیـەکی زۆر لەخـەڵکان گرفتـاری ئاوسـانی سـك بـوون و ژمارەیـەکیان مـردن. مردووەکـان بەرادەیـەك زۆر بـوون بـەخاك سـپاردنیان ئەگـەری نـەبوو و سـەك گۆشـتی مردووەکانیـان دەخـوارد. ژمارەیـەکی زۆر لەدانیـشتووانی بەغـداد بـەرەو بەسـرە ڕۆشتن. زۆربەی ئەوان لەرێگەدا مردن. ئەوانەی گەیشتنە شارەکە، دوای ماوەیەك گیانیان سپارد. ماڵ و زەوییەکان بەنان دەفرۆشرا. کاتێك دانەوێڵە گەیشت، نرخی شتومەك دابەزی.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عیسا کوڕی داود کوڕی جەراحی وەزیر لەتەمەنی نـەوەد ساڵی مرد. پێشتر ئاماژەمان بەدینداری و شیاوی ئەوداوە.

لـەم سـاڵەدا بـاوکی قاسـم عومـەر کـوڕی حـسەین کـوڕی عەبدوڵلـەی حـەرەقی، فەقیهی حەنبەلی، چاوی لێکنا و لەزیحەججە/ جولای ئەم ساڵە ئەبوبەکری شیبلی سۆق، مرد و لـەرەبیع الاوەل/ ئۆکتۆبـەری ئـەم سـاڵە محەممـەد کـوڕی عیـسا بـاوکی عەبدوڵله، ناسراو بەباوکی موسا، فەقیهی حەنبەلی، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و پێنجی کۆچی( ٩٤٦ زایینی )

لەموحرەم/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە مۆعیزئەلدەولە لەبەغداد جێگیر بوو و موتیع الله دوای دڵنیا بوون، بۆ کۆشکی خەلافەت گەڕاندەوە. پێشتر بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەمان پێدا.

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە و ناسرئەلدەولە پەیمانی ئاشتییان بەست. نوێنەرەکانی ئاشتی نێوان ئەم دووانە بەدوور لەچاوی تورکە تەوزونییەکان هاموشۆیان دەکرد. ناسرئەلدەولە لەرۆژهەڵاتی تکریت ئوردووی لێدابوو و کاتێک تورکەکان ئاگادار بوونەوە، دژی ناسرئەلدەولە شۆڕشیان کرد. ناسرئەلدەولە هەڵات و لەدیجلە گوزەری کرد و لەبەشی رۆژئاوای تکریت نیشتەجێ بوو. پەنای بۆ مولهیم و قەرەمتییەکان برد. ئەوان پەنایاندا و ئەویان لەگەڵ شێرزاد بۆ موسڵ نارد.

## جەنگی تەکین لەگەڵ ناسرئەلدەولە

کاتێک ناسرئەلدەولە لەجەنگی تورکەکان هەڵات و تورکەکان نەیانتوانی بیگرن، بڕیاریاندا تەکینی شیرازی وەك فەرماندەی خۆیان دەستنیشان بکەن. کوڕی قەرابە و دەبیرەکانی ناسرئەلدەولە و هاوەڵانی دیکەی ئەو، قۆلبەست کران چوونکە هاوکارییان نەکردن.

ناسرئەلدەولە کاتێک گەیشتە جۆهەینە، کوڕی شێرزادی گرت. ناسرئەلدەولە لەموسڵ نەمایەوە و بەرەو نەسیبین بەرێکەوت و تەکین و تورکەکان ڕۆشتنە ناو موسڵ و شوێن ناسرئەلدەولە کەوتن. ناسرئەلدەولە لەنەسیبینەوە بەرەو سنجار(شەنگال) ملی ڕێگەی گرتەبەر و تەکین بەدوایەوە بوو. ناسرئەلدەولە لەسنجارەوە ڕێگەی حەدیسەی گرتەبەر و تەکین بەدوایەوە بوو.

ناسرئەلدەولە نامەیەکی بۆ مۆعیزئەلدەولە نووسی و داوای هاوکاری کرد. مۆعیزئەلدەولە سوپایەکی بۆ هاوکاری ئەو نارد. ناسرئەلدەولە لەحەدیسەوە

ڕێگـەی سـەنی گرتەبـەر و لـەوێ پەیوەسـتی سـوپاکەی مۆعیزئەلدەولـە بـوو. سەیمەری، وەزیری مۆعیزئەلدەولە لەناو ئەم سوپایەدا دەبینرا. ئەوان بۆ جەنگی تـەکین بـەرەو حەدیسە بەڕێکـەوتن و ڕووبـەرووی سـوپاکەی بوونـەوە. شـەڕێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند. تەکین و تورکەکان کە لەسەرکەوتن نزیك ببوونەوە، شکستیان خوارد و هەڵاتن و هاوەڵە عەرەبەکانی ناسرئەلدەولە شوێنیان کەوتن و ژمارەیـەکی زۆریـان لـەوان کوشـت. تـەکینی شـیرازیان گـرت و بردیانـە لای ناسرئەلدەولە. ناسرئەلدەولە هەردوو چاوی دەرهێنا و ئەوی بۆ یەکێك لەقەڵاکانی خۆی نارد و زیندانی کرد.

ناسرئەلدەولە و سەیمەری ڕێگەی موسڵیان گرتەبەر و لەڕۆژهەڵاتی ئەو شارە ئوردوویان لێدا. لەم کاتەدا ناسرئەلدەولە سوار ئەسپەکەی بوو و ڕۆشتە خێوەتی سەیمەری و کاتێك ڕۆشتە ناو و هاتەدەر، یەکسەر ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و چیتر بـۆ لای ئـەو نەگەڕایـەوە. دەگێڕنـەوە کەناسـرئەلدەولە وتـی: کاتێـك ڕۆشـتمە خێوەتەکـەی ئـەو، پەشـیمان بوومـەوە و بـەخێرایی هاتمـەدەر. لەسـەیمەریش دەگێڕنـەوە کـەوتی: کاتێـك ناسـرئەلدەولە لەخێوەتەکـەم ڕۆشـتەدەر، پەشـیمان بوومەوە لەوەی نەمگرت. دواتر سەیمەری، کوڕی شێرزادی بەهەزار خەروار گەنم و جۆ و شتی دیکە لەناسرئەلدەولە کرییەوە.

## زاڵبوونی ڕۆکن ئەلدەولە لەڕەی

کاتێك —وەك ئامـاژەی پێـدرا— لـەناو سـوپای خوراسـانییەکان ناسـازگاری هاتـە ئاراوە و باوکی عەلی بۆ خوراسان گەڕایەوە، ڕۆکن ئەلدەولە ڕێگەی ڕەی گرتەبەر و دەستی بەسەردا گرت. هەروەها سـەرزەمینەکانی دەوروبـەری چیاکانی خستە ژێـر فـەرمانی خـۆی و خوراسـانییەکانی دەرپەڕانـد. بـەم شـێوەیە سـنووری فەرمانڕەوایـەتی منداڵـەکانی بوویـە فـراوان بـوو و دەسـتیان بەسـەر ڕەی، چیاکان، فارس، ئەهواز، عێراقدا گرت و باجی موسڵ، دیاربەکر و دیـاری مـوزێر بۆ ئـەوان ڕەوانە دەکرا.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەنێوان مۆعیزئەلدەولە کوڕی بویە و باوکی قاسم کوڕی بورەیدی، فەرمانڕەوای بەسرە، ناسازگاری هاتە ئاراوە و مۆعیزئەلدەولە سوپایەکی بۆ بەسرە ڕەوانە کرد. کوڕی بورەیدی لەرێگەی دەریا و وشکانییەوە سوپای بۆ بەسرە نارد. دوو سوپا دەستیان بۆ شمشێر برد و سەرئەنجام سوپاکەی بورەیدی هەلاّتن و دەستەیەك لەگەورەکانی ئەوان کوژرا.

لەم ساڵەدا ئەسیرە موسوڵمان و ڕۆمییەکان لەسەر سنور، ئاڵ و گۆڕ کران. نەسر سەمەلی، فەرمانڕەوای سنورەکانی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان، ئەم کارەی ڕێکخست. ژمارەی ئەسیرەکان بەژن و پیاو، دوو هەزار و چوارسەد و هەشتا کەس بوو. ڕۆمییەکان دووسەد و سی ئەسیری زیاتریان لەدەستدا بوو. سەیف ئەلدەولە بەهای ئازادی ئەوانیدا و ئازاد کران.

لەشەعبان/ فەوریەی ئەم ساڵە سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان، باوکی ئیسحاق محەممەدی قەراریتی گرت. سەیف ئەلدەولە ئەوی بۆ پشتیوانی لەباوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەلی سەرمەن ڕائی وەك دەبیر دەستنیشان کردبوو. دواتر باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی فەهدی موسڵی وەك دەبیر دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی نەجرا کوڕی عەبدوللەی فارسی، فەقیهی شافعی، لەمانگی شەوال مرد. محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی عەبدوللە کوڕی عەباس کوڕی محەممەد کوڕی سەوڵ ئەبوبەکری سەوڵی کۆچی دوای کرد. ئەو شارەزای ئەدەب و مێژوو بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و شەشەی کۆچی ( ٩٤٧ زایینی )

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە لەگەڵ خەلیفە موتیع بەرەو بەسرە بەڕێکەوت تا ئەو شارە لەدەستی باوکی قاسم عەبدوللە کوڕی باوکی عەبدوللەی بورەیدی دەربێنێت. ئەوان لەڕێگەی دەشت بەرەو ئەو شارە بەڕێکەوتن. قەرەمتییەکان لەهەجەرەوە پەیامیان بۆ مۆعیزئەلدەولە نارد و ڕەخنەیان لەهاتنی ئەوان بۆ دەشت گرت بێ وەرگرتنی مۆڵەتی ئەوان چوونکە دەشت، لەژێر فەرمانی ئەواندا بوو. مۆعیزئەلدەولە وەڵامی نامەی ئەوانی نەدایەوە و بەنوێنەرەکەی ئەوانی وت: پێیان بڵێ ئێوە کێن کەفەرمان دەدەن و مەبەستی من لەگرتنی بەسرە لەناو بردنی ئێوەیە و بەم زووانە دەبینن لەمنەوە چ بەڵایەکتان بەسەردا دێت.

کاتێك مۆعیزئەلدەولە گەیشتە درهەمییە، سوپای باوکی قاسم داوای ئەمانی لێکرد و باوکی قاسم لەبیست و چواری ڕەبیع الاخر/ بیست و پێنجی نۆڤەمبەر بۆ هەجەر هەلات و پەنای بۆ قەرەمتییەکان برد. مۆعیزئەلدەولە دەستی بەسەر بەسرەدا گرت و نرخی شتومەك لەم شارەدا بەرادەیەکی بەرچاو دابەزی.

مۆعیزئەلدەولە لەئەهوازەوە ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر تا سەردانی عیماد ئەلدەولەی برای بکات. ئەو خەلیفە و باوکی جەعفەری سەیمەری لەبەسرە بەجێهێشت. لەم کاتەدا گورگیر کەیەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی مۆعیزئەلدەولە بوو، ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر و مۆعیزئەلدەولە، سەیمەری بۆ جەنگی ئەو نارد. سەیمەری ڕووبەڕووی گورگیر بوویەوە و شکستی پێهێنا و ئەسیری کرد. مۆعیزئەلدەولە ئەوی لەقەڵای رامهورموز زیندانی کرد. مۆعیزئەلدەولە لەشەعبان/ فەوریە لەئەرجان چاوی بەبراکەی کەوت و لەبەرابەر ئەو سەری کوڕنوشی دانەواند و لەخزمەتیدا وەستا. هەرکات مۆعیزئەلدەولە مۆڵەتی دانیشتنی پێدەدا، مۆعیزئەلدەولە بۆ ڕێزگرتن لەبراکەی دانەدەنیشت. مۆعیزئەلدەولە بۆ بەغداد گەڕایەوە. خەلیفە موتیعیش گەڕایەوە بۆ ئەو شارە بەڵام وای نیشاندا مەبەستی ڕۆشتن بۆ موسڵی لەسەردایە. نوێنەرەکان لەنێوان ئەو و ناسرئەلدەولە هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی ئاشتی لەنێوانیاندا سەقامگیر کرا. ناسرئەلدەولە سامانی بۆ مۆعیزئەلدەولە نارد و ئەوی بێدەنگ کرد.

## ناسازگاری محەممەد کوڕی عەبدرەزا لەتوس

محەممەد کوڕی عەبدرەزاق لەتوس و ناوچەکانی دەوروبەری ژیانی بەسەر دەبرد و ئەم سەرزەمینانە لەژێر دەستی کارگوزارەکانی ئەودا بوو. ئەو لەگەڵ ئەمیر نوح کوڕی نەسری سامانی ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر و مەنسور کوڕی قەراتکین، فەرماندەی سوپای خوراسان، لەمەرو، لای نوح بوو. وەشمگیر، هەڵاتوو لەجورجانەوە خۆی گەیاندە ئەم دووانە. حەسەن کوڕی فیرزان دەستی بەسەر جورجاندا گرتبوو. نوح؛ فەرمانی بەمەنسوردا بەرەو نەیشابور بڕوات و ڕووبەڕووی محەممەد کوڕی عەبدرەزاق ببێتەوە و دەست بەسەر هەموو سەرزەمینەکانی ژێر دەستی ئەودا بگرێت و دواتر لەگەڵ وەشمگیر بەرەو جورجان بەرێکەوێت. مەنسور و وەشمگیر بەرەو نەیشابور بەرێکەوتن. نەیشابور لەدەستی محەممەد کوڕی عەبدرەزاقدا بوو. محەممەد لەنەیشابورەوە بەرەو ئوستوا هەڵات. مەنسور شوێنپێی هەڵگرت و محەممەد ڕێگەی جورجانی گرتەبەر و نامەی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە نووسی و داوای ئەمانی لێکرد. ڕۆکن ئەلدەولە فەرمانی پێدا ڕێگەی ڕەی بگرێتەبەر.

مەنسور لەنەیشابورەوە بەرەو توس بەرێکەوت و ڕافیع کوڕی عەبدرەزاقی لەقەڵای شەمیلان ناکاوگیر کرد. دەستەیەك لەهاوەڵانی ڕافیع داوای ئەمانیان لێکرد و ڕایفع لەشەمیلان، بۆ قەڵای دەرەك هەڵات و مەنسور دەستی بەسەر شەمیلاندا گرت و سامانەکانی تاڵان کرد. ڕافیع لەقەڵای دەرەك سەنگەری گرت چوونکە ژن و منداڵەکەی لەم قەڵایەدا بوون. ئەم قەڵایە لەسێ فەرسەخی شەمیلاندا بوو. مەنسور شەمیلانی وێران کرد و بەرەو دەرەك بەرێکەوت و ناکاوگیری کرد. چەند ڕۆژێك لەگەڵ ڕافیع جەنگی. ئاوی دەرەك بۆگەنی کرد. لەم کاتەدا ئەحمەد کوڕی عەبدرەزاق لەگەڵ دەستەیەك لەکوڕە مامەکان و بنەماڵەکەی داوای ئەمانیان لەمەنسور کرد. براکەی ئەو ڕافیع کەل و پەلە زێڕین و زیوینەکانی لەراخەرێکەوە پێچا و لەقەڵاکەوە هەڵیدایەخوار و خۆی لەگەڵ دەستەیەك هاتنە خوارو هەڵیانگرت و لەکوێستاندا بڵاو بوونەوە.

مەنسور بەتەواوی دەستی بەسەر قەڵای دەرەکدا گرت و بنەماڵەی محەممەد کوڕی عەبدرەزاق و دایکی ئەوی بۆ بوخارا نارد و لەوێ زیندانی کردن. محەممەد کوڕی عەبدرەزاق لەجورجانەوە ڕێگەی ڕەی گرتەبەر. ڕەی لەژێر فەرمانی ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویەدا بوو. ڕۆکن ئەلدەولە ڕێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد و سامان و پارەی زۆری خستە بەردەست و ئەوی - دواتر ئاماژەی پێدەدەین- بۆ جەنگی مەرزوبان ڕەوانە کرد.

## فەرمانڕەوای حەسەن کوڕی عەلی لەسەقەلیبە

لەم ساڵەدا مەنسور(خەلیفەی فاتمی) حەسەن کوڕی عەلی کوڕی باوکی حەسەنی کەلبی وەك فەرمانڕەوای دوورگەی سەقەلیبە دەستنیشان کرد. ئەوی لای مەنسور پێگەیەکی بەرزی بوو و لەجەنگ دژی باوکی یەزید ئەرکێکی گەورەی خستە سەرشانی خۆی.

هۆکاری لەم کارە ئەوە بوو کافرەکان لەم دیارەدا لەرۆژگاری عەتاف لەبەر ناتەوانی و سستی ئەو، گرنگییان بەموسوڵمانان نەدەدا و لەپێدانی ماف ئاگربڕ خۆیان بەدوور گرت. لەسەقەلیبە دەستەیەك لەگەورەکانی مناڵەکانی تەبەری پێگە و جێگەیەکی بەرزیان پێبڕابوو و ژمارەیەکی زۆر لەدەوریان کۆببوونەوە. ئەوان دژی عەتاف ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە و خەڵکی شارەکە لەرۆژی جەژنی رەمەزانی ساڵی ٣٣٥/ بیست و پێنجی ئاوریلی ٩٤٧ زایینی هاوکارییان کردن و ژمارەیەك لەپیاوەکانی عەتافیان کوشت. عەتاف هەڵات و پەنای بۆ قەڵای شارەکە برد. شۆڕشییەکان تەپڵ و ئاڵاکانی ئەویان ڕفاند وبۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. عەتاف پەیکی بۆ لای مەنسور نارد و ئاگاداری کردەوە و داوای هاوکاری لێکرد.

کاتێك مەنسور ئاگادار بوویەوە، حەسەن کوڕی عەلی وەك فەرمانڕەوای سەقەلیبە دەستنیشان و بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانەی کرد. حەسەن کوڕی عەلی بەکەشتی بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت و لەشاری مازر لەنگەری گرت و کەس بۆ بینینی ئەو نەهات. ئەو یەك رۆژ لەوێ مایەوە. لەکاتی شەو، دەستەیەك لەدانیشتووانی ئەفریقیە و کەتامە و شوێنەکانی دیکە هاتنە لای حەسەن و پێیان

وت لەکوڕی تەبەری و هاوەڵانی ئەو ترساون و نەیانتوانیوە سەردانی بکەن و ئەوەی عەلی کوڕی تەبەری و محەممەد کوڕی عەبدون و دەستەیەکی دیکە بەرەو ئەفریقییە بەرێکەوتوون و پێشنیاریان بەیەك کردووە رێگە لەهاتنی ئەو بۆ شارەکە بگرن و رێگە نەدەن لەکەشتییەکانی تۆ نزیك نەبنەوە تا وەڵامی نامەی ئەوان لەمەنسورەوە بگات. ئەوان داوایان لەمەنسور کردووە کەسێکی دیکە بۆ فەرمانڕەوایەتی ئەوان هەڵبژێرێت.

دواتر دەستەیەکی دیکە لەهاوەڵانی تەبەری لێیان نزیك بوونەوە تا ژمارەی ئەوان بخەملێنن. ئەوانیان بەدەستەیەکی کەم بینی و چاوی تەماحیان تێبڕین. رێگەی فرت و فێڵیان گرتەبەر و حەسەنیش بەهەمان شێوە. دواتر ئەوان بۆ شارەکە گەڕانەوە. حەسەن بەڵێنی پێدان کەتا کاتی گەڕانەوەیان لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە بەڵام کاتێك ئەوان ڕۆشتن، پێش ئەوەی بتوانن سوپاکەی خۆیان کۆبکەنەوە و رێگەی رۆشتنی لێ بگرن، بەخێرایی بەرەو سەقلییە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە بەیزا، فەرمانڕەوای شارەکە و کاردارەکان و سەرپەرەستی دیوانەکان و ئەوەی خوازیاری بەختەوەری بوو، هاتە لای حەسەن و سەردانیان کرد و رێزیان لێگرتن. حەسەن پرسیاری بارودۆخی ئەوانی کرد.

ئیسماعیل کوڕی تەبەری کاتێك لەهاتنی ئەو دەستەیە ئاگادار بوویەوە، بەناچاری سەردانی کردن و حەسەن چاوی پێیکەوت و رێزی لێگرت. ئەو بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە و حەسەن ڕۆشتە ناو شارەکە. شوێنکەوتەکان و خراپەخوازانی تەبەری پەیوەستی بوون.

کاتێك تەبەری ئەم بارودۆخەی بینی، فەرمانی بەیەکێك لەپیاوانی سەقلییەدا یەکێك لەکۆیلەکانی حەسەن کە بەبوێری و ئازایەتی ناسرابوو، بۆ ماڵەکەی خۆی ببات. کاتێك ئەو کۆیلە ڕۆشتە ماڵی ئەو پیاوە، ئەو خۆی لەماڵەکە هەڵدایەدەر و هاواری کرد: ئەم پیاوە هاتۆتە ماڵەکەی من و دەیوێت ژنەکەم لێ بستێنێت. دانیشتووانی شار کۆبوونەوە. کوڕی تەبەری ئەوانی بۆ جموجۆڵ ناچار کرد و لەسوپاکەی حەسەن ئەوانی ترساند و وتی: هێشتا شارەکەیان نەگرتووە، ئەم کردەوەکانیانە. فەرمانی بەخەڵکاندا بڕۆنە لای حەسەن. گومانی دەکرد حەسەن

سزای کۆیلەکەی نادات و بەمشێوەیە خەڵکان دژی ئەو شۆڕش دەکەن و لەشارەکە دەریدەپەڕێنن.

کاتێک خەڵک کۆبوونەوە و ئەم پیاوە هاواری دەکرد، حەسەن بانگی کرد و لەچۆنیەتی رووداوەکەی پرسی و سوێندیدا تا راستی بێنێتە سەرزمان. حەسەن فەرمانی کوشتنی کۆیلەکەیدا. دانیشتووانی شار شادمان بوون و وتیان: هەنووکە ئاسوودە بووین و دڵنیاین شارەکەمان ئاوەدان دەبێتەوە و حەسەنیان بەکەسێکی دادپەروەر لەقەڵەمدا بەپێچەوانەی خواستی کوڕی تەبەری. حەسەن بەشێوەیەکی ترساو لەشارەکە مایەوە.

لەم کاتەدا مەنسور پەیامی بۆ حەسەن نارد کەعەلی کوڕی تەبەری و محەممەد کوڕی عەبدون و محەممەد کوڕی جەنا و هاوەڵانی ئەوان لەگەڵ ئیسماعیل کوڕی تەبەری و رەجا کوڕی جەنا و محەممەد و شوێنکەوتە ناسازگارەکانی دیکە قۆڵبەست بکەن. ئەم کارە بۆ حەسەن دژوار بوو. کەسی بەدوای تەبەریدا نارد و پێی وت: تۆ بەڵێنت بەمن داوە بەمەبەستی پیاسە سەردانی باخەکەی تۆ بکەین، هەنووکە دەرفەتێکی گونجاوە و دەمەوێت کەمێك بحەسێینەوە. حەسەن کەسێکی بەدوای شوێنکەوتە ناسازگارەکاندا نارد تا لەزمانی کوڕی تەبەرییەوە داوایان لێبکات بۆ پیاسە کردن بڕۆنە باخەکە. ئەوانیش هاتن. حەسەن درێژەی بەوتەکانیدا تا تاریکی دەستی پێکرد، دواتر پێی وتن: هەنووکە شەو داهاتووە و ئێمە میوانی ئەمیرین، باشتر وایە شەو لەم باخەدا بەسەر ببەین و کەسی بۆ لای هاوەڵانی ئەوان نارد و وتی ئێمە شەو لەباخ دەمێنینەوە، بڕۆن و بەیانی بگەڕێنەوە. کاتێك هاوەڵانی ئەوان ڕۆشتن، حەسەن هەموویانی گرت و سامانەکانی ئەوانی زەوت کرد. سامانەکان زۆر بوون. خەڵکانیش پەیوەستیان بوون و ورەیان بەرز بوویەوە. کاتێك رۆمییەکان ئەمەیان بینی، باجی ئاگر بڕی سێ ساڵانەیان ڕەوانە کرد.

دواتر پاشای رۆم سەرکردەیەکی لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەرێگەی دەریاوە بەرەو سەقەلییە نارد. ئەم سەرکردەیە لەگەڵ سەرادگوس یەکی گرت. حەسەن کوڕی عەلی، مەنسوری لەم هەواڵە ئاگادار کردەوە. مەنسور چەندین کەشتی لەگەڵ

حەوت هەزار سوارکار و سێ هەزار و پێنسەد پیادە، جگە لەجەنگاوەرە دەریاییەکان، بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد. حەسەن خۆی سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و لەرێگەی دەریا و وشکانییەوە بەرێکەوت و گەیشتە مەسینی. سوپایی موسوڵمانان بەخێرایی بەرەو ریۆ بەرێکەوتن و حەسەن لەسەرزەمینی تەلوریە دەستە جەنگاوەرەکانی بڵاو کردەوە. خۆی لەجەراجە دابەزی و گەمارۆی خستە سەر ئەم شارە. تینویەتی تەنگی بەدانیشتووانی ئەم شارە هەڵچنی بەڵام ئاگادار بوونەوە رۆمییەکان بۆ هاوکاری ئەوان بەرێکەوتوون، حەسەن لەبری وەرگرتنی بڕێك پارە، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان واژۆ کرد و بۆ جەنگی رۆمییەکان ئەسپی غاردا. رۆمییەکان بێ جەنگ بۆ شاری بارە هەڵاتن و حەسەن ڕۆشتە قەڵای قەسانە و دەستەکانی خۆی بۆ قەلورییە ڕەوانە کرد. حەسەن یەك مانگ لەقەسانە مایەوە تا ئەوەی دانیشتووانی ئەم شارە خوازیاری ئاشتی بوون و ئەو بەوەرگرتنی پارە ئاڵای ئاشتی بەرز کردەوە.

زستان لەرێگەوە گەیشت و سوپاکەی حەسەن بۆ مەسینی گەڕایەوە و کەشتییەکان زستان لەوێ لەنگەریان گرت. مەنسور پەیامی نارد و فەرمانی گەڕانەوەی حەسەنی بۆ قەلورییە دەرکرد.

حەسەن بەرێکەوت و پردی جەراجەی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشت. موسوڵمانان لەگەڵ سەرداگوس و سوپای رۆم لەرۆژی عەرەفەی ساڵی ٣٤٠/ هەشتی مەی ٩٥٢ زایینی رووبەروو بوونەوە و شەڕێکی کەم وێنەیان ئەنجامدا. رۆمییەکان هەڵاتن و موسوڵمانان شمشێریان خستە ناویان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و سامان وکەرەستەی جەنگ و چوارپێی زۆریان وەك تاڵانی کۆکردەوە.

لەساڵی ٩٥٢/٣٤١ زایینی حەسەن مەبەستی جەراجەی کرد. کۆنستانتین، پاشای رۆم، نوێنەرێکی بۆ لای حەسەن نارد و پێشنیاری ئاشتی پێکرد. حەسەن ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر و بۆ ریۆ گەڕایەوە و لەناوەڕاستی شارەکە بناغەی مزگەوتێکی گەورەی داڕشت و لەیەکێك لەسووچەکانی منارەیەکی بۆ شوێنی بانگ خوێندن دروست کرد. پەیمانی لەگەڵ رۆمییەکان بەست لەئاوەدان کردنەوە و نوێژ خوێندن لەناو مزگەوتەکە و بانگدان، کۆسپ و تەگەرە نەخەنە سەر ڕێگەی

موسـوڵمانان و هـیچ مەسـیحییەك نەڕواتـە نـاو مزگەوتەكـە و هـەر ئەسـیرێكی موسوڵمان بگاتە ئەو مزگەوتە، لەئەماندا بێت، چ لەدین هەڵگەڕاوە بێت یا لەسەر دینەكەی خۆی مابێتەوە. ئەگەر بەردێك لەم مزگەوتە هەڵكەنن، هەموو كەنیسە و دێرەكانیـان لەسـەقەلییە و ئەفریقییـە وێـران دەبێـت. ڕۆمییـەكان بەریـسوایی و سەرشـۆڕی بـەم پـەیمان نامەیـە رازی بـوون و حەسـەن تامـەرگی مەنـسور و فەرمانڕەوایی مـۆعیز لەسەقەلییە مایـەوە و دواتـر – وەك ئامـاژەی پێدەدرێت– بۆ لای مۆعیز ڕۆشت.

## شۆڕشی جومان لەرەحبە و دەرئە نجامەكەی

جومـان لـەهاوەڵانی تـەوزون و دواتـر پەیوەسـتی ناسـرئەلدەولە كـوڕی حەمـدان بـوو. كاتێـك ناسـرئەلدەولە لەبەشـی رۆژهـەڵاتی بەغـداد لەگـەڵ مۆعیزئەلدەولـە دەجـەنگی، هـەموو دەیلەمییـەكانی خستە ژێـر فـەرمانی جومـان چوونكە بـاوەڕی بـەوان نـەدەكرد و ئـەوی وەك فـەرمانڕەوایی رەحبـە دیـاری و بـۆ ئـەو سـەرزەمینە ڕەوانـەی كـرد. جومـان لـەوێ پێگـەی بـەرز بوویـەوە و خـەڵكان لەهـەموو سـوچ و كەنارەكانـەوە پەیوەسـتی دەبـوون. بـەم شـێوەیە جومـان دژی ناسـرئەلدەولە ئـاڵای شۆڕشـی بـەرز كـردەوە و مەبەسـتی ئـەوەی كـرد دەسـت بەسـەر رەققـە و مـوزێردا بگرێت. بۆ ئەم مەبەستە رێگەی ڕەققەی گرتەبەر و بۆ مـاوەی حەڤدە رۆژ گـەمارۆی خـستەسەر. دانیـشتووانی رەققـە رووبـەڕووی بوونـەوە و شكـستیاندا. خـەڵكانی رەحبەیش هێرشیان كردە سەر كارگوزارانی ئەو و خوێنی ئەوانیان ڕشت چوونكە ستەمكار و خراپەكار بوون.

كاتێك جومـان لەرەققە گـەڕایـەوە، شمـشێری لـەكێلان دەركێـشا، ژمارەیـەكی زۆر لەدانیـشتووانی ئـەو شـارەی كوشـت. ناسـرئەلدەولە سـوپایەكی بەفەرمانـدەیی یاروخ، پەردەدارەكەی خۆی، بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە كرد و دوو سوپا لەكـەنارەكانی فورات رووبەرووی یەكبوونەوە و سەرئەنجام، جومان شكستی خوارد و كەوتـە نـاو رووبـاری فورات و نغـرۆ بـوو. سـوپاكەی داوای ئـەمانیان لـەیاروخ كـرد. جومانیـان لەناو هێنایەدەر و بەخاكیان سپارد.

## فەرمانڕەوایی ڕۆکن ئەلدەولە لەتەبەرستان و جورجان

لەرەبیع الاوەل/ سێپتامبەری ئەم ساڵە ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە لەگەڵ حەسەن کوڕی فیرزان پەیمانیان بەست و مەبەستی گرتنی سەرزەمینی وەشمگیریان کرد. وەشمگیر ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرەئەنجام، شکستی خوارد و ڕۆکن ئەلدەولە دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرت و لەوێوە ڕوویکردە جورجان و ئەو شارەیشی خستە ژێر فەرمانی خۆی. سەد و سیانزە کەس لەسەرکردەکانی وەشمگیر داوای ئەمانیان لێکرد. حەسەن کوڕی فیرزان لەجورجان مایەوە. وەشمگیر ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و داوای هاوکاری لەخوراسانیان کرد تا سەرزەمینە لەدەست چووەکانی وەربگرێتەوە. سەرئەنجام ئەوە ڕوویدا کەئاماژەی پێدەدرێت.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەسەفەر/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی کلکدار لەئاسمان دەرکەوت بەدرێژایی دوو زەرع لەرۆژهەڵاتی ئاسمان و دە ڕۆژ دەبینرا و دواتر دیار نەما.

لەم ساڵەدا سەلامەی تولونی، پەردەداری خەلیفەکان، مرد. ئەو کاتەی زیندوو بوو، بنەماڵە و سامانەکانیان لێ زەوت کرد. لەرۆژگاری موستەکفی سەلامەیان بۆ شام ڕەوانە کرد و لەرێگە، دەستیان بەسەر سامانەکەیدا گرت. ئەو لەم ساڵەدا مرد و سامان و گیانی لەدەستدا. چەند هۆنراوەیەکی جوانە:

و اذا خشیت من الامور مقدرا فهربت منه فنحوه تتقدم

واتاکەی: هەرکات لەکارەکانی قەزا و قەدەر (ئەوەی دەبێت ڕووبدات) ترسایت و ڕێگەی هەڵاتنت گرتەبەر، زیاتر لێی نزیك دەبیتەوە.

هەروەها لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی حیماد باوکی عەباس ئەسرەمی موقری کۆچی دووای کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و حەوتی کۆچی ( ٩٤٨ زایینی )

فەرمانڕەوایی مۆعیزئەلدەولە لەموسڵ و گەڕانەوەی لەو شارە

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە بۆ جەنگ لەگەڵ ناسرئەلدەولە لەبەغدادەوە بەرەو موسڵ بەرێکەوت و کاتێك ناسرئەلدەولە لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، بەرەو نەسیبین هەڵات. مۆعیزئەلدەولە لەرەمەزان/ مارس گەیشتە موسڵ و شارەکەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و ستەمی لەدانیشتووانەکەی کرد و دەستی بەسەر سامانی خەڵکاندا گرت. دانیشتووانی شارەکە نفرینیان دەکرد.

مۆعیزئەلدەولە بڕیاریدا دەست بەسەر هەموو سنووری فەرمانڕەوایەتی ناسرئەلدەولەدا بگرێت بەڵام لەرۆکن ئەلدەولەی برایەوە هەواڵی پێگەیشت کەسوپای خوراسان مەبەستی هێرش کردنە سەر ڕەی و جورجانیان لەسەردایە و داوای هاوکاری لێکرد. مۆعیزئەلدەولە ناچار بوو پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ناسرئەلدەولە ببەستێت. نوێنەرەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد و سەرئەنجام، پەیمانی ئاشتی نێوانیان لەسەر ئەو بنەمایە واژۆ کرا کە ناسرئەلدەولە باجی موسڵ و جەزیرە کەهەشت هەزار هەزار درهەم بوو، ساڵانە بۆ مۆعیزئەلدەولە ڕەوانە بکات و لەسنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی بەناوی عیماد ئەلدەولە و رۆکن ئەلدەولە و مۆعیزئەلدەولە کوڕی بویە، وتار بخوێنێتەوە. کاتێك ئاڵای ئاشتی هەڵکرا، مۆعیزئەلدەولە بۆ بەغداد گەڕایەوە و لەزیجەججە/ ژوئەنی ئەم ساڵە گەیشتە ئەو شارە.

## ڕەوانە بوونی سوپای خوراسان بەرەو جورجان

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی قەراتکین لەگەڵ سوپای خوراسان بەرەو جورجان بەرێکەوت. وەشمگیر هاورێیەتی دەکرد. حەسەن کوڕی فیرزان فەرمانڕەوایەتی جورجانی دەکرد. مەنسور گومانی لەوەشمگیر کردبوو و لەکاتی رێگە پۆشتن خۆی لەوەشمگیر دوور دەخستەوە و کاتێك لەحەسەن کوڕی فیرزان نزیك کەوتەوە، لەسەر بنەمای بەبارمتە گرتنی کورەکەی، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست.

کاتێك ڕۆکن ئەلدەولە لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە، بۆ دوو براکەی عیماد ئەلدەولە و مۆعیزئەلدەولە نامەی نووسی و داوای هاوکاری لێکردن. عیماد ئەلدەولە دوو هەزار جەنگاوەری بۆ هاوکاری ئەو نارد و مۆعیزئەلدەولە، سوپایەکی بەفەرماندەیی سەبوکتەکین ڕەوانە کرد و لەخەلیفە موتیع، خەلیفەی عەباسی، فەرمانی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە ڕەوانە کرد. کاتێك سوپاییەکانی سەبوکتەکین گەیشتنە دینەوەر، دەیلەمییەکانی ناو سوپاکەی ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە و شەوانە هێرشیان کردەسەر. ئەو سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و هەڵات. تورکەکان پەیمانیان لەگەڵ بەست و دەیلەمییەکان زانیان چیتر ناتوانن زیانی لێ بدەن. لەبەر ئەمە بەناچاری بۆ لای ئەو گەڕانەوە و گریان و شین و ڕۆڕۆیان دەست پێکرد و سەبوکتەکین لێیان خۆش بوو.

ڕۆکن ئەلدەولە ڕێگەی فرت و فێڵی لەگەڵ مەرزوبان گرتەبەر و ئەوی بەکەسێکی گەورە لەقەڵەمدا و نامەی بۆ نووسی تا چاوپۆشی لەسنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو بکات و لەبەرابەردا زەنجان، ئەبهەر و قەزوێن بخاتە ژێر فەرمانی خۆی. نوێنەرەکان بۆ ئەم مەبەستە لەنێوانیاندا هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی هێزەکانی عیماد ئەلدەولە و مۆعیزئەلدەولە گەیشتنە لای سوپاکەی ڕۆکن ئەلدەولە. محەممەد کوڕی عەبدرەزاق هاتە بارەگاکەی و حەسەن کوڕی فیرزان سوپایەکی بەفەرماندەیی محەممەد کوڕی ماکان بۆ هاوکاری ڕۆکن ئەلدەولە ڕەوانە کرد. کاتێك سوپاکەی ڕۆکن ئەلدەولە بەهێز بوو، دەستەیەك لەو سەرکردانەی قۆڵبەست کرد کەگومانی دووروویی لێدەکردن و بەرەو قەزوێن بەرێکەوت. مەرزوبان لەگەڵ ئەوەی دەیزانی ناتوانێت بەرگەی سوپاکەی بگرێت، بیری لەهەڵاتن نەکردەوە و دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. سوپاکەی مەرزوبان شکستی خوارد و خۆی ئەسیر کرا. ئەویان بردە سومەیرەم و لەوێ زیندانیان کرد. ڕۆکن ئەلدەولە گەڕایەوە و محەممەد کوڕی عەبدرەزاق لەکەنارەکانی ئازەربایەجان مایەوە.

شوێنکەوتەکانی مەرزوبان، پەیوەستی باوکی، محەممەد کوڕی موسافیر بوون و ئەویان کردە فەرماندەی خۆیان. کوڕەکەی تری موسافیر، وەهسوزان، بۆ قەڵاکەی هەڵات و محەممەد بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ سوپاییەکان دەکرد.

دواتر مەنسور ئاگادار بوویەوە ئەمیر نوح، کچی ئەختەکین، موالی قەراتکینی، وەك هاوسەری خۆی دەستنیشان کردووە. ئەختەکین، بوست و روخجی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە. مەنسور ئەم پەیوەندییەی پێ خۆش نەبوو و بووە هۆی پەرێشانی ئەو. نوح پێشتر کچی مەنسوری بۆ یەکێك لەکۆیلەکانی بەناوی فەتکین خوازبێنی کردبوو. مەنسور وتی: کچی ئەختەکین دەکاتە هاوسەری خۆی و کچەکەی من دەکاتە هاوسەری کۆیلەکەی. ئەمە وای لێکرد لەگەڵ حەسەن کوڕی فیرزان ڕێگەی سازان بگرێتەبەر و کوڕەکەی ئەوی کەوەك بارمتە لای خۆی ڕاگرتبوو، بۆ لای ئەو ڕەوانە کردەوە و خۆی ڕێگەی نەیشابوری گرتەبەر. حەسەن کوڕی فیرزان لەزوزەن و وەشمگیر لەجورجان مایەوە.

## ڕۆشتنی مەرزوبان بۆ ڕەی

لەم ساڵەدا مەرزوبان کوڕی محەممەد کوڕی موسافیر، فەرمانڕەوای ئازەربایەجان، ڕێگەی شاری ڕەی گرتەبەر چوونکە ئاگادار بوویەوە سوپای خوراسان بەرێکەوتووە و ئەمە دەبێتە هۆی پەرێشانی ڕۆکن ئەلدەولە. مەرزوبان نوێنەرێکی بۆ لای مۆعیزئەلدەولە نارد و مۆعیزئەلدەولە ڕیشی نوێنەرەکەی تاشی و جوێنی بەخۆی و سەروەرەکەیدا. مەرزوبان ئەمەی پێ ناخۆش بوو و سوپای کۆکردەوە. لەم کاتەدا یەکێك لەسەرکردەکانی ڕۆکن ئەلدەولە داوای ئەمانی لێکرد و بۆ گرتنی ڕەی، تەماحی خستەبەردەست و ئاگاداری کردەوە کەسەرکردەکانی ئەولا، خوازیاری پەیوەست بوون بەون.

ئەو تەماحی گرتنی ئەو شارەی کرد و ناسرئەلدەولە نامەی بۆ نووسی و بەڵێنی هاوکاری پێدا و پێشنیاری پێکرد سەرەتا دەست بەسەر بەغداد بگرێت بەڵام مەرزوبان رازی نەبوو. ئەو، دواتر باوك و وەهسوزانی برای بانگ کرد و لەم بارەوە راوێژی پێکردن. باوکی ڕێگەی ڕۆشتن بۆ ڕەی لێگرت بەڵام مەرزوبان رازی نەبوو. کاتی ماڵئاوایی باوکی گریا و پێی وت: کوڕم، دوای ئەمە لەکوێ بەدوای تۆدا بگەڕێم؟ مەرزوبان وەڵامی دایەوە: یا لەکۆشکی فەرمانڕەوای ڕەی، یا لەناو کوژراوەکان.

سوپاییەکان مەبەستی کوشتنی محەممەدیان کرد. محەممەد بۆ لای وەهسوزانی کوڕی هەلآت. وەهسوزان باوکی کرت و بارودۆخی لێ دژوار کرد تا مرد. لەم کاتەدا وەهسوزان جڵەوی کاروبارەکانی خۆی لەدەستدا و دەیسەمی کوردی کەکوردەکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون، بان کرد و هێزی پێبەخشی و بۆ جەنگی محەممەد کوڕی عەبدرەزاق ڕەوانەی کرد. دوو سوپا دەستیان بۆ شمشێر برد و لەکۆتاییدا سوپاکەی دەیسەم شکستی خوارد و کوڕی عەبدرەزاق زیاتر لەجاران بەهێز بوو. ئەو، لەکەنارەکانی ئازەربایەجان باجی کۆکردەوە و لەساڵی ٩٥٩/٣٣٨ زایینی بۆ ڕەی گەڕایەوە و نامەی بۆ ئەمیر نوح نووسی و دیاری بۆ نارد و داوای لێکرد بیبەخشێت. نوح ئەوی بەخشی و نامەی بۆ وەشمگیر نووسی تا رزگاری بکات. وەشمگیر رزگاری کرد. محەممەد کوڕی عەبدرەزاق لەساڵی ٩٥٠/٣٣٩ زایینی کاتی هێرشی مەنسور بۆ ڕەی، بۆ توس گەڕایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان هێرشی کردە سەر ڕۆم و ڕۆمییەکان لەبەرابەر سوپاکەی خۆڕاگرییان کرد و دەرئەنجامی جەنگەکە، سەیف ئەلدەولە شکستی خوارد و ڕۆمییەکان دەستیان بەسەر مەرعەشدا گرت و ڕووبەڕووی تەرسوییەکان بوونەوە.

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە، ئیسفەهدوست، خاڵی خۆی، کەیەکێك لەسەرکردە گەورەکانی بوو، قۆڵبەست کرد.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ئیسفەهدوست، بەردەوام ئامۆژگاری دەکرد و رەخنەی لەکارەکانی دەگرت ودەوترا ئەو نامەی بۆ خەلیفە موتیع نووسیوە و خوازیاری کوشتنی مۆعیزئەلدەولە بووە. لەبەر ئەمە مۆعیز ئەلدەولە گرتی و بۆ رامهورموزی نارد تا لەوێ زیندانی بکرێت.

لەم ساڵەدا باوکی قاسمی بورەیدی داوای ئەمانی لەمۆعیزئەلدەولە کرد و هاتە بەغداد و چاوی بەمۆعیزئەلدەولە کەوت. مۆعیزئەلدەولە رێزی گرت و ئەوی وەك یەکێك لەکارگوزارەکانی خۆی دەستنیشان کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و هەشتی کۆچی( ٩٤٩ زایینی )

### سەرەتای دەرکەوتنی عیمران کوڕی شاهین

لەم ساڵەدا عیمران کوڕی شاهین دەرکەوت و پێگەی بەرز بوویەوە. ئەو سەرەتا یەکێك لەدانیشتووانی جامیدە بوو، چەند کەسێکی کوشت و لەترسی سوڵتان بۆ بوتەیحە هەڵات و لەناو قامیشەلاَن و جەنگڵەکان ژیانی بەسەر دەبرد و بۆ دابین کردنی خۆراك، بەراوی باڵندە و ماسی بەسەندەی دەکرد. دواتر لەرێگەکانی بوتەیحە، دزی و چەتەیی کردە پیشە و دەستەیەك راوچی و دز لەدەوری کۆبوونەوە و ناوی کەوتە سەرناوان و لەحکومەت رزگاری بوو. بەڵام چوونکە دەترسا لەوەی حکومەت مەبەستی لەناوبردنی بکات، داوای ئەمانی لەباوکی قاسمی بورەیدی کرد. باوکی قاسم بەرێوەبردنی جامیدە و کەنارەکانی بەتائیحی پێسپارد. ئەو لەهێز کۆکردنەوە بەردەوام بوو تا ئەوەی ژمارەی هاوەڵانی زیادی کرد. کەرەستەی جەنگی دابین و لەبەرزاییەکانی بوتەیحە نیشتەجێ و دەستی بەسەر ئەو ناوچانەدا گرت.

کاتێك پێگەی بەرز بوویەوە، مۆعیزئەلدەولە، وەزیرەکەی، باوکی جەعفەری سەیمەری لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. سەیمەری چەندین جار ڕووبەرووی بوویەوە و بنەماڵەکەی ئەسیر کرد تا ئەوەی عیمران کوڕی شاهین هەڵات و خۆی شاردەوە.

لەم کاتەدا لەناکاو عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە مرد و سوپاکەی ئەو لەفارس گرفتاری دووبەرەکی بوو. مۆعیزئەلدەولە نامەیەکی بۆ سەیمەری نووسی و فەرمانی پێدا بەخێرایی بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانی شیراز بەرێکەوێت. ئەویش دەستی لەعیمران هەڵگرت و بەرەو شیراز ئەسپی غاردا - لەکاتی ئاماژەدان بەمەرگی عیماد ئەلدەولە ئاماژەی پێدەدەین-. کاتێك سەیمەری بەتائیحی بەجێهێشت، عیمران کوڕی شاهین دەرکەوتەوە و سەرلەنوێ کارەکانی دەست پێکردەوە و سوپا بلاَوەکەی کۆکردەوە. لەداهاتوودا تا ئەو جێگەی پێویست بێت ئاماژە بەگێڕانەوەکانی تایبەت بەو دەدەین.

## مەرگی عیماد ئەلدەولە کوڕی بویە

لەجومادی الاخرە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە عیماد ئەلدەولە باوکی حەسەن کوڕی بویە لەشیراز مرد. چۆنیەتی مەرگی ئەو بەم شێوە بوو: گورچیلەی چڵکی کرد و ئەم نەخۆشییە درێژەی کێشا و چەندین ناخۆشی دیکەی لێکەوتەوە و کاتێك لەمەرگی خۆی دڵنیا بوو، کەسی بۆ لای رۆکن ئەلدەولەی برای نارد و داوای لێکرد کوڕەکەی، عێزەد ئەلدەولە فەنا خوسرەو بۆ لای ئەو رەوانە بکات تا بیکاتە جێگری خۆی و وەك فەرمانڕەوای فارس دەستنیشانی بکات چوونکە عیماد ئەلدەولە کوڕی نەبوو. رۆکن ئەلدەولە کوڕەکەی خۆی لەگەڵ چەند کەسێك لەبڕواپێکراوان بۆ لای عیماد ئەلدەولە نارد. عیماد ئەلدەولە و هەموو سوپاکەی پێشوازییان لێکرد و ئەوی لەماڵەکەی خۆی لەسەر تەخت دانیشاند و خۆی لەبەرابەری وەستا و داوای لەخەڵکان کرد سڵاو بۆ عێزەدئەلدەولە بنێرن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بن. رۆژێکی شکۆدار و سەرەنج راکێش بوو.

لەناو سەرکردەکانی عیماد ئەلدەولە دەستەیەك لەگەورەکان دەبینران کە عیماد ئەلدەولە لێیان دەترسا و ئەوانی بەکەسێکی دەسەلاتخواز دەبینی و رەچەڵەك و بنەماڵەی خۆیان بەگەورەتر لەبنەماڵە و رەچەڵەکی ئەو دەزانی و بۆ پێشکەوتن خۆیان بەشیاوتر لەقەڵەم دەدا. عیماد ئەلدەولە لەگەڵ ئەوان رێکدەکەوت. کاتێك برازاکەی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشاند، لەوان ترسا و لەبەر ئەمە ئەوانی گرت و کوشتی. یەکێك لەگەورەکان ناوی شیرنەحین بوو. عیماد ئەلدەولە ئەوی گرت بەڵام هاوەڵان و سەرکردەکانی دیکە نێوەنجیگەرییان کرد و خوازیاری ئازادی ئەو بوون. عیماد ئەلدەولە وتی: من بەسەرهاتێکی ئەو دەگێڕمەوە و ئەگەر بەبیستنی دووبارە خوازیاری ئازادی ئەو بوون، ئازادی دەکەم. وتی: پێشتر لەخوارسان لەناو سوپاکەی نەسر کوڕی ئەحمەدی سامانیدا بووم. ئێمە دەستەیەکی کەمی دەیلەمییەکان بووین. شیرنەحین لەگەڵماندا بوو. رۆژێك نەسر دانیشتبوو و بەندەکانی خۆی و بەندەکانی باوکی کەجگە لەسوپاییەکان ژمارەیان دە هەزار کەس دەبوو، لەخزمەتیدا بوون. شیرنەحینم بینی تیغێکی ڕووتی لەناو جلەکانی شاردۆتەوە. پێم وت: ئەمە چییە؟ وتی: دەمەوێت ئەم مناڵە -یانی نەسر- بکوژن و ترسم نییە لەوەی چیم بەسەردێت چوونکە خۆم بەگەورەتر لەوە دەزانم لەخزمەتی مناڵێکی ئاوادا بم.

نەسر کوڕی ئەحمەد لەو کاتەدا بیست ساڵە بوو، تازە موو لەروخساری دەڕوا. زانیم ئەگەر بیکوژێت، نەك خۆی بەڵکو ئێمەیش بەکوشتن دەدات. دەستیم گرت و وتم: پێویستە گفتوگۆت لەگەڵ بکەم. ئەوم بردە سووچێك و دەیلەمییەکانم کۆکردەوە و لەمەبەستەکەی ئەو ئاگادارم کردنەوە. ئەوان تیغەکەیان لێسەند. هەنووکە دەخوازن دوای بیستنی ئەم بەسەرهاتەی ئەو لەگەڵ ئەحمەد کوڕی نەسر، دووبارە ئەو لەبەرابەر ئەم منداڵە- یانی برازاکەی خۆم- بەجێبێڵم؟ چیتر کەس قسەی نەکرد و شیرنەحین تامردن لەزیندان مایەوە.

عیماد ئەلدەولە مرد و عێزەدئەلدەولە لەفارس مایەوە. بەڵام دووبەرەکی و ناسازگاری لەناو هاوەڵانی هاتە ئاراوە. مۆعیزئەلدەولە نامەیەکی بۆ وەزیرەکەی، سەیمەری نووسی و داوای لێکرد دەست لەجەنگ دژی عیمران کوڕی شاهین هەڵگرێت و بەرەو شیراز بڕوات. ئەو بەرەو فارس بەرێکەوت و ڕۆکن ئەدەولەیش گەیشت و هەردووك بڕیاریاندا پێگەی عێزەدئەلدەولە بەهێز بکەن. ڕۆکن ئەلدەولە، عەلی کوڕی کامەی کەیەکێك لەگەورە هاورێکانی خۆی بوو، وەك جێگر لەڕەی دانا. کاتێك ڕۆکن ئەلدەولە گەیشتە شیراز، سەرەتا ڕۆشتە سەر ئارامگای براکەی لەئیستەخر. ئەو بەسەری رووت و پێی پەتی - سوپاکەیشی بەهەمان شێوە- سێ ڕۆژ لای گۆڕی براکەی مایەوە تا ئەوەی سەرکردەکان داوایان لێکرد بۆ شارەکە بگەڕێتەوە. ڕۆکن ئەلدەولە بۆ شارەکە گەڕایەوە و نۆ مانگی لەشیراز بەسەر برد و بۆ مۆعیزئەلدەولەی برای سامان و کەرەستەی جەنگی فراوانی ڕەوانە کرد.

عیماد ئەلدەولە ئەو کاتەی زیندوو بوو، بەئەمیری ئەمیرەکان ناوی دەبرا و کاتێك مرد، ئەم نازناوە بەرۆکن ئەلدەولەی برای برا. مۆعیزئەلدەولە دەستی بەسەر عێراق و خەلیفەدا گرتبوو و هاوشێوەی نوێنەری دوو براکەی لەقەڵەم دەدرا. عیماد ئەلدەولە پیاوێکی بەخشندە، خۆڕاگر، بیرمەند و سیاسەتزان بوو.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەجومادی الاخرە/ دێسامبەری ئەم ساڵە باوکی سائیب عوتەبە کوڕی عەبدوللە، وەك قازی قازییەکانی بەغداد دەستنیشان کرا.

لەرەبیع الاخر/ سێپتامبەری ئەم ساڵە موستەکفی (خەلیفەی پێشوو) بەهۆی خوێنبەربوون لەکۆشکی خەلافەت مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و سی و نۆی کۆچی ( ٩٥٠ زایینی )

### مردنی سەیمەری و وەزارەتی موهەلبی

لەم ساڵەدا باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی ئەحمەدی سەیمەری، وەزیری مۆعیزئەلدەولە لەکەنارەکانی جامیدە مرد. ئەو لەفارسەوە بەرەو ئەو ناوچەیە ڕۆشت و گەمارۆی خستە سەر عیمران کوڕی شاهین کە لەناکاو تایەکی کوشندە بەرۆکی گرت و لەپێی خست.

مۆعیزئەلدەولە دوای ئەو باوکی محەممەد حەسەن کوڕی محەممەدی موهەلبی لەجومادی الاوەل/ ئۆکتۆبەر وەك وەزیر دەستنیشان کرد. ئەو لەبارەگای مۆعیزئەلدەولە جێگری سەیمەری و شارەزای کاروباری دیوانەکان و بەڕێوەبردنی وڵات بوو. مۆعیزئەلدەولە ئەوی ئەزمون کرد و لەئەمانەتداری، شیاوی، سوودمەندی بۆ وڵات و کردار پاکی ئەو بۆ وڵات ئاگادار بوویەوە و پێگەی وەزارەتی پێبەخشی. باوکی محەممەد کرداری چاکەی گرتەبەر بەتایبەت لەبەسرە دادپەروەری بڵاو کردەوە. سوپاکەی بورەیدی ستەمی زۆری لەخەڵك کردبوو بەلام ئەو، دادی بۆ ستەملێکراوان گەڕاندەوە و زاناکان و ئەدیبەکانی لەخۆی نزیك کردەوە و ڕێزی گرتن. بۆ بڵاو کردنەوەی دادپەروەری و گەڕاندنەوەی سامانی خەڵکان سەردانی شارەکانی دەکرد و ناو و نیشانێکی چاکەی لەخۆی بەجێهێشت. (خوا بیبەخشێت.)

### هێرشی سەیف ئەلدەولە بۆ سەرزەمینی رۆم

لەم ساڵەدا سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان هێرشی کردە سەر سەرزەمینی ڕۆم و جەنگی دەستپێکرد. ئەو ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ڕۆم و چەندین قەلای گرت و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر و تالانی فراوانی کۆکردەوە و کاتێك مەبەستی گەڕانەوەی کرد، ڕۆمییەکان ڕێگەیان لێگرت و موسوڵمانانی سوپاکەی یا کوژران، یا ئەسیر

کران. رۆمییەکان هەموو ئەسیر و تالآنییەکانیان لەموسوڵمانان سەندەوە و سامانی موسوڵمانانیان تالآن کرد. سەیف ئەلدەولە و ژمارەیەکی کەم گیانی خۆیان رزگار کرد.

## گەڕاندنەوەی حەجەر الاسوەد لەلایەن قەرەمتییەکانەوە

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان حەجەرئەلئەسوەدیان بۆ مەککە گەڕاندەوە و وتیان: بەپێی فەرمانێك بردمان و بەپێی فەرمانێك گەڕاندمانەوە.

پێشتر بەجکەم بۆ گەڕاندنەوەی ئەو بەردە پەنجا هەزار دیناری دابوو بەڵام ئەوان نەیانگەڕاندەوە و لەزیقەعدە/ ئاوریلی ئەم ساڵە بێ وەرگرتنی پارە گەڕاندیانەوە. کاتێك مەبەستی گەڕاندنەوەی بەردەکەیان کرد، سەرەتا بردیان کوفە و لەمزگەوتی هەینی ئەو شارە هەڵیانواسی تا خەڵکان ببینن و دواتر بردیانە مەککە. ئەوان ئەو بەردەیان لەساڵی ٩٢٩/٣١٧ زایینی لەماڵی خوا هەڵکەند. ئەم بەردە بۆ ماوەی بیست و دوو ساڵ لەدەستی ئەواندا بوو.

## هێرشی خوراسانییەکان بۆ رەی

لەسەفەر/ جولای ئەم ساڵە مەنسور کوڕی قەراتکین لەنەیشابورەوە هێرشی کردەسەر ڕەی. ئەمیر نوح فەرمانی ئەم هێرشەی پێدا. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا رۆکن ئەلدەولە لەسەرزەمینی فارس بوو. مەنسور گەیشتە ئەو شارە کە لەژێر فەرمانی عەلی کوڕی کامە، نوێنەری رۆکن ئەلدەولەدا بوو. عەلی کوڕی کامە هەڵات و رێگەی ئیسفەهانی گرتەبەر. مەنسور ڕۆشتە شارەکە و دەستی بەسەردا گرت و سوپاکەی بۆ ناوچەکانی دەوروبەر نارد و توانیان دەست بەسەر سەرزەمینی چیاکان تا قەرمیسین بگرن و نوێنەرکانی رۆکن ئەلدەولە لەم ناوچانە دەربەڕێنن. هەروەها فەرمانڕەوایەتی هەمەدان و شارەکانی دیکەیان گرتەدەست.

رۆکن ئەلدەولە لەفارس لەم رووداوە ئاگادار بوویەوە. نامەیەکی بۆ مۆعیزئەلدەولەی برای نووسی وفەرمانی پێدا بۆ دەرپەڕاندنی سوپای جێگیر

لەکەنارەکانی عێراق سوپایەك بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە بکات. مۆعیزئەلدەولە، سەبوکتەکینی پەردەداری لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەتورکمانەکان و دەیلەمییەکان و عەرەبەکان ڕەوانە کرد. کاتێك سەبوکتەکین بەغدادی بەجێهێشت، باروبنەی خۆی لەو شارە خست و شەوانە بەخێرایی خۆی گەیاندە خوراسانییەکانی قەرمیسین و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشی کردە سەریان و ژمارەیەك لەوانی کوشت و فەرماندەی ئەوانی گرت کەناوی بەجکەمی خومارتەکینی بوو. ئەو، بەجکەمی لەناو گەرماودا گرت و ئەوی لەگەڵ ئەسیرەکانی دیکە بۆ لای مۆعیزئەلدەولە ڕەوانە کرد. مۆعیزئەلدەولە بۆ ماوەیەك لەزینداندا هێشتییەوە و دواتر ئازادی کرد.

کاتێك سەربازە خوراسانییەکان لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە، لەهەمەدان کۆبوونەوە. سەبوکتەکین هێرشی کردە سەریان و ئەوان بێ جەنگ هەڵاتن و شارەکەیانە بەجێهێشت. سەبوکتەکین ڕۆشتە هەمەدان و تا گەیشتنی ڕۆکن ئەلدەولە لەشەوال/ مارس لەوێ مایەوە.

مەنسور لەڕەی لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر هەمەدان کەڕۆکن ئەلدەولەیش لەوێ بوو. کاتێك گەیشتە بیست فەرسەنگی هەمەدان، ڕێگەی ئیسفەهانی گرتەبەر. ئەگەر هێرشی دەکردە سەر هەمەدان، ڕۆکن ئەلدەولە شارەکەی پێدەسپارد و مەنسور دەیتوانی بەهۆی چەند بەرەکی سوپای ڕۆکن ئەلدەولە دەست بەسەر ئەو سەرزەمینەدا بگرێت بەڵام بەفەرمانی خواوەند ئەو کارەی نەکرد. ڕۆکن ئەلدەولە فەرمانی بەسەبوکتەکیندا فەرماندەیی سوپاکەی ئەو لەئەستۆ بگرێت، بەڵام کاتێك ئەو کارەی کرد، تورکەکان ئالاّی شۆڕشیان بەرز کردەوە. ڕۆکن ئەلدەولە وتی: ئەمانە دوژمنن و لەناو خۆماندا ژیان بەسەر دەبەن، کەواتە باشترە جەنگی خۆمان لەمانەوە دەست پێبکەین. جەنگی دژی تورکەکان دەست پێکرد و ژمارەیەکی لەوان کوشت. تورکەکان هەڵاتن.

مۆعیزئەلدەلە لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە و نامەیەکی بۆ کوڕی باوکی شوکی کوردی و کەسانی دیکە نووسی و فەرمانی پێدان شوێنپێی تورکەکان هەڵگرن و سەرکوتیان بکەن. ئەوان شوێن تورکەکان کەوتن و ژمارەیەکی بەرچاویان لێ کوشتن. پاشماوەی تورکەکان بۆ موسڵ هەڵاتن. ڕۆکن ئەلدەولە ڕێگەی ئیسفەهانی

گرتەبەر بەڵام کوڕی قەراتکین پێشتر گەیشتبووە ئەو شارە و هاوەڵان و بنەماڵەی ڕۆکن ئەلدەولە لەگەڵ کەل و پەلەکانیان بەپەرێشیانی، سوار ئەسپ و کەر و مانگا بوون و هەڵاتن. کرێی یەك مانگا یا کەر تا خانی لەنجان کە لەنۆ فەرسەنگی ئیسفەهاندا بوو، دەگەیشتە سەد درهەم. ئەم دەستەیە نەیانتوانی لەخانی لەنجان دوورتر بڕۆن. ئەگەر مەنسور لەکاتی خۆیدا دەگەیشت دەیتوانی سامانی ئەوان تالان بکات و تا ئەو لای ئیسفەهان بخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە بەڵام ڕۆشتە ئیسفەهان و لەوێ مایەوە.

ڕۆکن ئەلدەولە لەخانی لەنجان ئوردووی لێدا و چەندین جار ڕووبەڕووی خوراسانییەکان بوویەوە. هەردوو سوپا گرفتاری کەمی خواردەمەنی بوون تا ئەو جێگەی چوارپێکانی خۆیان سەردەبڕی و دەیانخوارد. ئەگەر ڕۆکن ئەلدەولە دەیتوانی هەڵبێت، ئەو کارەی دەکرد بەڵام نەیدەتوانی. ئەو شەوێك لەگەڵ وەزیرەکەی باوکی فەزڵ کوڕی عەمید سەبارەت بەهەڵاتن ڕاوێژی کرد. باوکی فەزڵ پێی وت: هیچ پەنایەك جگە لەرازی بوون بەچارەنووسی خوایی نییە، کەواتە پەیمان ببەستە دوای ئەمە خێرخوازی موسوڵمانان بیت و بەشێوەیەکی چاکەکارانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەیت و ڕێزیان بگریت تا خواوەند هاوکاریت بکات چوونکە هەموو دەرگاکان بەڕووی ئێمەدا داخراوە و ئەگەر هەڵبێین، شوێنپێمان هەڵدەگرن و لەناومان دەبەن چوونکە ژمارەی ئەوان زیاترە و کەس لەئێمە ڕزگاری نابێت. ڕۆکن ئەلدەولە وتی: پێشتر خۆیشم گەیشتمە ئەم ئەنجامە.

دوای دوو سێ شەو، هەواڵ گەیشت کەمەنسور و سوپاکەی خێوەتەکانی خۆیان بەجێ هێشتووە و بەرەو ڕەی بەڕێکەوتوون. هۆکارەکەی نەبوونی ئالیك و خواردەمەنی بوو. دەیلەمییەکانیش گرفتاری ئەم بەڵایە بوون بەڵام خۆڕاگرتر بوون، ئەگەر وشترێکیان سەردەبڕی یا چوارپێیەکی دیکە، گۆشتەکەیان کەم کەم دابەش دەکرد و کەمتریان دەخوارد و خۆڕاگرییان دەکردە پیشە بەڵام خوراسانییەکان بەپێچەوانەوە زێدەڕۆییان دەکرد و خۆڕاگریش نەبوون. ئەوان دژی مەنسور ڕاپەڕین و ئەو بەناچاری لەمانگی موحەرەمی ساڵی سێسەد و چل گەڕایەوە و سوپای گەڕاندەوە.

رۆکن ئەلدەولە لەهەواڵی ڕۆشتنی خوراسانییەکان ئاگادار بوویەوە بەڵام باوەڕی نەکرد تا ئەوەی چەندین جار ئەم هەواڵەی پێگەیشت. ئەوسا لەگەڵ سوپاکەی سوار بوون و ئەوەی لەخوراسانییەکان بەجێمابوو، تاڵانییان کرد.

باوکی فەزڵ کوڕی عەمید دەڵێت: لەکۆتایی هەمان شەو رۆکن ئەلدەولە منی بانگ کرد وتی: ئەمشەو لەخەودا بینم سوار لەسەر فیروزم (ئەسپەکەی) و تۆ لەگەڵ مندایت و ڕێگەچارە لەشوێنێك کەگومانمان نەدەکرد، گەیشت، لەدنیای خەودا چاوم کردەوە و ئەنگوستیلەیەکم لەسەر زەوی بینی، کاتێك هەڵمگرت، بینیم نقێمەکەی فیروزەیە، کردمە ئەنگوستی خۆم و بەپیرۆزم زانی و لەسەرکەوتنی خۆم دڵنیا بووم چوونکە مانای فیروزە (یا هەمان فیروز) سەرکەوتنە و لەبەر ئەمە ئەسپەکەی خۆم بەفیروز ناو دەبەم.

کوڕی عەمید دەڵێت: لەم کاتەدا هەواڵی ڕۆشتنی دوژمنمان پێگەیشت، سەرەتا باوەڕمان نەدەکرد تا ئەوەی چەندین کەسی دیکە ئەو هەواڵەیان هێنا. ئێمە سوار ئەسپەکانی خۆمان بووین بۆ ئەوەی بزانین دوژمن بۆ هەڵاتووە. بەوشیاری ڕێگەمان دەبڕی دەترساین لەوەی دوژمن بۆسەی نابێتەوە. شان بەشانی رۆکن ئەلدەولە دەڕۆشتم. لەناکاو رۆکن ئەلدەولە هاواری کرد و بەکۆیلەکەی وت: ئەو ئەنگوستیلەم پێبدە. کۆیلە ئەنگوستیلەکەی لەسەر زەوی هەڵگرت و دای بەرۆکن ئەلدەولە. بینینمان فیروزەیە. رۆکن ئەلدەولە کردییە ئەنگوستی خۆی و وتی: ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەی من بوو و ئەمە ئەو ئەنگوستیلەیە شەو لەخەودا بینیم. ئەمە یەکێك لەجوانترین و سەرسوڕهێنەرترینی ئەو بەسەرهاتانەیە کەبیستوومە.

## ڕووداوەکانی عیمران کوڕی شاهین و هەڵاتنی سوپای مۆعیزئەلدەولە

پێشتر سەبارەت بەبارودۆخی عیمران کوڕی شاهین دوای ڕۆشتنی سەیمەری و بەهێز بوونەوەی دووبارەی ئەو قسەمان کرد. مۆعیزئەلدەولە، روزبەهانی بۆ جەنگی شاهین ڕەوانە کرد. روزبەهان لەگەورەکانی سوپای مۆعێزئەلدەولە بوو. روزبەهان جەنگی دەستپێکرد و عیمران درێژەی بەم جەنگەدا و لەناو پێچ و پەنای قامیشەڵانەکان پەنای گرت. روزبەهان بێزار بوو و هێرشی کردەسەر و عیمران

سەرکەوتنی بەدەست هێنا و خۆی و هاوەڵانی دوور کردەوە. ژمارەیەك لەوان کوژران و کەرەستەکانی جەنگیان تاڵان کرا. عیمران بەتاڵان کردنی ئەم کەرەستانە دووبەرابەر بەهێز بوو. سوپاکەی چاوی تەماحیان بڕییە دروست کردنی حکومەتێکی جیاواز و هەرکەس لەبەرێوەبەرانی حکومەتی لای ئەوان گوزەری دەکرد، داوای ماف پارێزگارییان دەکرد. ئەگەر پارەی دەدا، ئازادیان دەکرد و گەرنە، لێیان دەدا و ریسوایان دەکرد و جوێنیان پێدەدا.

سوپای حکومەتی بۆ ڕۆشتن بۆ سەرزەمین و ماڵی خۆیان لەبەسرە بەناچاری دەبوا لەوێ گوزەر بکەن. دواتر ڕێگەکانی بەسرە جگە لەبیابان بەستران. خەڵك سکاڵایان بۆ مۆعێزئەلدەولە بەرز کردەوە. ئەویش نامەیەکی بۆ موهەلبی وەزیر نووسی و فەرمانی پێدا بەرەو واست بڕوات. ئەو لەبەسرە بوو. موهەلبی بەرێکەوت و مۆعێزئەلدەولە، بەسەرکردە و سوپا وکەرەستەی جەنگ هاوکاری و دەستی ئەوی بۆ سەر سامان و خەرجییەکان ئاوەڵا کرد. ئەو بەرەو قامیشەلان بەرێکەوت و بارودۆخی لەعیمران دژوار کرد و ڕێگەکانی هاتوچۆی لێگرت. موهەلبی گەیشتە ئەو شوێنانەی کەجگە لەعیمران و سوپاکەی کەس شارەزای نەبوو. روزبەهان حەزی دەکرد موهەلبیش وەك خۆی رووبەرووی شکست ببێتەوە و شانازی بەسەرکەوتنی خۆیەوە نەکات. لەبەر ئەمە پێشنیاری بەموهەلبی کرد هێرش بکاتە سەر عیمران، بەڵام موهەلبی رازی نەبوو. روزبەهان نامەیەکی بۆ مۆعێزئەلدەولە نووسی و موهەلبی بەکەسێکی ناتەوان لەقەڵەمدا و وتی: ئەو لەم جەنگەدا کەمتەرخەمی دەکات تا خەرجیی زیاتر وەربگرێت و ئەوەی ئەنجام بدات کەدەخوازێت. مۆعێزئەلدەولە نامەیەکی بۆ موهەلبی نووسی و سەرکۆنەی کرد و ئەوی بەکەمتەرخەم لەقەڵەمدا. موهەلبی جڵەوی کاروبارەکانی لەدەستدا و ئەوەی کرد کەنەیدەخواست و لەگەڵ هەموو سوپاکەی بەرەو قامیشەڵانەکە بەرێکەوت و هێرشی کردە سەر عیمران. عیمران لەم قامیشەڵانەدا بۆسەی نابوویەوە. روزبەهان کشایەوە تا لەکاتی شکست زیانی پێنەگات.

کاتێك موهەلبی پێشڕەوی کرد، ئەوانەی بۆسەیان نابوویەوە، هێرشیان کردە سەر سوپاکەی. سەربازەکانی موهەلبی یا کوژران یا نغرۆ بوون یا ئەسیر کران.

روزبەهان لەگەڵ سەربازەکانی بێ زیان گەڕایەوە. موهەلبی خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە و خۆی رزگار کرد. عیمران، سەرکردەکان و گەورەکانی موهەلبی ئەسیر کرد و مۆعیزئەلدەولە بەناچاری رێگەی ئاشتی گرتەبەر و کەسان و براکانی عیمرانی ئازاد کرد. عیمران لەبەرابەردا ئەسیرەکانی ئازاد کرد. مۆعیزئەلدەولە فەرمانڕەوایەتی بەتائیحی پێسپارد و بەم شێوەیە پێگەی عیمران بەرز بوویەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەشەوی شەممە/ چواردەی زیحەججە/ بیست و پێنجی مەی ئەم ساڵە، مانگ بەتەواوی گیرا.

لەموحرەم/ جونی ئەم ساڵە ئەبوبەکر محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی قەرابە لەموسڵ مرد و تابوتەکەی بۆ بەغداد گوێزرایەوە.

لەم ساڵەدا باوکی نەسر محەممەد کوڕی محەممەدی فارابی، حەکیم و فەیلەسوفی ناودار، نوسەری چەندین کتێب لەبواری فەلسەفە و زانست، لەدیمەشق مرد. ئەو قوتابی یوحەنا کوڕی حەیلان، کە لەرۆژگاری موقتەدر مردبوو، بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەبدولرەحمان کوڕی ئیسحاقی زەجاجی، مرد. دەڵێن ئەو لەساڵی ٩٥١/٣٤٠ زایینی مردووە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چلی کۆچی ( ٩٥١ زایینی )

**مەرگی مەنسور کوڕی قەراتکین و باوکی موزەفەر کوڕی موحتاج**

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی قەراتکین، فەرماندەی سوپای خوراسان لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ ئۆگۆست لەکاتی گەڕانەوە لەئیسفەهان بۆ ڕەی، کۆچی دوایی کرد. خەڵکی عێراق دەڵێن ئەو دوای گەڕانەوە بەنائومێدییەوە چەند شەو و ڕۆژێك بەخواردنەوە سەرقاڵ بوو تا ئەوەی جەڵتە لێیدا و مرد، بەڵام خەڵکانی خوراسان دەڵێن ئەو نەخۆش کەوت و مرد و خواوەند زاناترە.

دوای مەرگی ئەو سوپای خوراسان بۆ نەیشابور گەڕایەوە و تابوتی مەنسوری لەگەڵ خۆی برد و لای گۆڕی باوکی لەئەسبیجاب بەخاکیان سپارد.

سەرسوڕهێنەر ئەوەی دەوترا کاتێك مەنسور لەنەیشابور ڕێگەی ڕەی گرتەبەر، کۆیلەیەکی بۆ ئەسبیجاب نارد تا لای گۆڕی باوکی گۆڕێکی دیکە هەڵکەنێت و لەکاتی ماڵئاوایی بەکۆیلەکەی وت: دەڵێی جەستەی بێ گیانی من بۆ ئەو سەرزەمینە دەبەن. دوای ماوەیەك ئەوە ڕوویدا کەپێشبینی کردبوو. مەنسور مرد و جەنازەی ئەویان بردە خانگا و لای گۆڕی باوکی بەخاکیان سپارد.

لەم ساڵەدا باوکی موزەفەر کوڕی باوکی عەلی کوڕی موحتاج لەبوخارا مرد. سوار ئەو ئەسپە بوو کەباوکی بۆی ناردبوو. ئەم ئەسپە ڕەمی کرد و ئەوی کێشا بەزەویدا و موزەفەر کەوتە ژێر ئەسپەکە و ئێسقانەکانی شکا و هەمان ڕۆژ کۆچی دوایی کرد. ئەم پێشهاتە لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ ئۆگۆست ڕوویدا. مەرگی ئەو بۆ خەڵکان و ئەمیر نوح ناخۆش بوو. جەستەی بێ گیانی ئەویان بردە سەغانییان بۆ لای باوکی کە لەو دیارە بوو.

## گەڕانەوەی باوکی عەلی بۆ خوراسان

لەم ساڵەدا باوکی عەلی کوڕی موحتاج وەك فەرمانـدەی سوپای خوراسان دیاریکرا و فەرمانی پێدرا بۆ نەیشابور بگەڕێتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: مەنسور کوڕی قەراتکین لەسوپا بێزار و بەڕێوەبردنی کاروباری سوپاکەی بۆی دژوار ببوو. سوپاییەکانیش خۆپەسەندییان کردبووە پیشە و لەکەنارەکانی نەیشابور خراپەکارییان دەکردە پیشە. مەنسور بەردەوام نامەی بۆ ئەمیر نوح دەنارد و داوای دەکرد لەفەرماندەیی ئەم سوپایە دووری بخاتەوە و خوازیاری ئەوە بوو تەنیا فەرمانڕەوایەتی هەراتی لەژێردەستا بێت و ناوچەکانی دیکە بەکەسێکی دیکە بسپێرێت. نوح پەیامی بۆ نارد و بەڵێنی پێدا بۆ ئەو شوێنەی دەخوازێت، دەیگەڕێنێتەوە. کاتێك مەنسور مرد، ئەمیر نوح، خەڵات و ئاڵای فەرمانڕەوایەتی بۆ باوکی عەلی نارد و فەرمانی پێدا بەرەو نەیشابور بڕوات و ڕەی خستە ژێر دەستی ئەو و فەرمانی پێدا سەردانی ئەو شارەیش بکات. باوکی عەلی لەمانگی ڕەمەزان/ ژانویە سەغانییانی بەجێهێشت و کوڕەکەی، باوکی مەنسوری وەك جێگری خۆی لەو شارە بەجێهێشت. ئەو گەیشتە مەرو و لەوێ مایەوە تا کاروباری خوارەزم سامان درا چوونکە کاروباری ئەم شارە پەرێشان ببوو. دواتر ڕێگەی نەیشابوری گرتەبەر و لەزیحەججە/ ئاوریل ڕۆشتە ناو ئەو شارە و لەوێ نیشتەجێ بوو.

## جەنگی موسوڵمانان و ڕۆمییەکان لەسەقەلییە

مەنسوری عەلەوی، خەلیفەی ئەفریقییە، لەساڵی ٩٤٧/٣٣٦ زایینی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی باوکی حسەینی کەلبی وەك فەرمانڕەوای سەقەلییە دەستنیشان کردبوو. ئەو ڕۆشتە ئەو سەرزەمینە و وەك ئاماژەمان پێدا لەوێ مایەوە و چەندین جار ڕووبەڕووی ڕۆمییەکانی ئەو سەرزەمینە بوویەوە. ڕۆمییەکان داوای هاوکارییان لەپاشای قۆستەنتەنییە کرد و ئەویش سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری ئەوان نارد. ئەم سوپایە لەئەزرەنت ئوردووی لێدا. حەسەن کوڕی عەلی، مەنسوری

عەلەوی لەم پێشهاتە و بارودۆخی خۆی ئاگادار کردەوە. ئەویش سوپایەکی گەورەی بەفەرمانددەیی کۆیلەکەی نوح بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کرد. حەسەن سوپاکەی نوح و سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و بەرەو ڕیو بەرێکەوت و دەستە جەنگاوەرەکانی خۆی لەقەلورییە بلاو کردەوە. حەسەن جەراجەی ناکاوگیری کرد تا ئەو جێگەی ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانی ئەو شارە لەتینویەتیدا مردن و ئەوەندەی نەمابوو حەسەن دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت کە لەناکاو لەهێرشی ڕۆمییەکان ئاگادار بوویەوە. ئەو لەبەرابەر وەرگرتنی بڕێك پارە لەخەڵکانی ئەو شارە، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و هێرشی کردە سەر ڕۆم. کاتێك ڕۆمییەکان لەهاتنی حەسەن ئاگادار بوونەوە، بێ ڕوودانی جەنگ هەڵاتن و ئەزرەنتیان بەجێهێشت.

حەسەن ڕۆشتە قەڵای قەسانە و دەستە جەنگییەکانی خۆی بۆ تاڵان کردنی دەوروبەر ڕەوانە کرد. دانیشتووانی قەسانە لەبەرابەر پێدانی پارە ڕێگەی ئاشتییان لەگەڵ سوپاکەی حەسەن گرتەبەر. بارودۆخ تا مانگی زیحەججە/ ئاوریل بەم شێوەیە بوو.

لەشەوی جەژنی قوربان، سوپای قوستەنتەنییە و ڕۆمییەکان و سوپای موسوڵمانان لەسەقەلییە لەبەرابەر یەك ڕیزیان بەست. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و ڕۆمییەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان هێرشیان کردنەسەر و تا شەو لەکوشتن و ئەسیر کردن بەردەوام بوون. بەشی زۆری کەرەستەکانی جەنگ و چوارپێکانیان وەك تاڵانی کەوتە دەستی موسوڵمانان. سەری بڕاوی کوژراوەکانیان بۆ سەقەلییە و ئەفریقییە نارد. حەسەن دووبارە گەمارۆی خستە سەر جەراجە و بەوەرگرتنی باج، دووبارە پەیمانی ئاشتی بەست و حەسەن دەستی لێ هەڵگرتن. ئەو دەستەیەکی بۆ بەترقوقە ڕەوانە کرد و ئەوان دەستیان بەسەر ئەو شارەدا گرت و سامانەکانیان فڕاند. حەسەن تا ساڵی ٩٥٢/٣٤١ زایینی لەدوورگەی سەقەلییە مایەوە تا ئەوەی مەنسور مرد و حەسەن لەسەقەلییەوە ڕۆشتە لای مۆعیز کوڕی مەنسور لەئەفریقییە و کوڕەکەی باوکی حسەین ئەحمەدی وەك جێگری خۆی لەو سەرزەمینە دەستینشان کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا موهەلبی وەزیریان ئاگادار کردەوە پیاوێك بەناوی بوسرا لەبەغداد مردووە کەسەرۆکی دەستەی قەراقرییە بووە. ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد رۆحی باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی عەلی کوڕی باوکی قەراقەر لەجەستەی ئەودایە، هەروەها هاوەڵانی گومانیان دەکرد ئەو خوایە و رۆحی پێغەمبەران و راست کردارەکان لەجەستەی ئەودا تێکەڵ بووە. موهەلبی فەرمانیدا سامانەکانی بوسرا زەوت و و هاوەڵانی قۆڵبەست بکەن. جێگرەکەی بوسرایان گرت بەڵام سامانێکی ئەوتۆیان لەو بەدەست نەهێنا. تەنیا چەندین دەفتەریان دەستکەوت کەسەبارەت بەئایینەکەیان هەندێ شتی تیا نووسرا بوو.

لەناو ئەواندا گەنجێك دەبینرا بانگەشەی ئەوەی دەکرد رۆحی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجەستەی ئەودایە و ژنێك بەناوی فاتیمە کەئەویش دەیوت رۆحی فاتیمەی کچی پێغەمبەر(د.خ) لەجەستەیدایە و خزمەتکاری مناڵەکانی بێستام کەدەیوت رۆحی میکائیل لەجەستەیدایە.

موهەلبی فەرمانی گرتن و ئەشکەنجە کردنی ئەوانی دەرکرد. دواتر ئەم دەستەیە خۆیان گەیاندە ئەوکەسانەی دەیانتوانی مۆعێزئەلدەولە ببینن و خۆیان بەشیعەکانی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناساند. مۆعێزئەلدەولە فەرمانی ئازادی ئەوانی دەرکرد و موهەلبی لەوەترسا ئەگەر پێداگری لەسەر گرتنی ئەوان بکات، گومان دەکەن ئەو دژایەتی شیعەکان دەکات. لەبەر ئەمە بێدەنگی هەڵبژارد.

لەشەعبان/ ژانویەی ئەم ساڵە عەبدوللە کوڕی حسەین کوڕی لال باوکی حەسەنی کەرخی، فەقیهی ناوداری حەنەفی مرد. ئەو لەساڵی ٨٧٣/٢٦٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. پیاوێکی خۆپارێز و موعتەزیلی بوو.

لەم ساڵەدا باوکی جەعفەری فەقیە لەبوخارا چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و یەکی کۆچی ( ٩٥٢ زایینی )

### گەمارۆدانی بەسرە

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی وەجیە، فەرمانڕەوای عەمان، لەڕێگەی دەریا و وشکانییەوە هێرشی کردە سەر بەسرە و گەمارۆی خستەسەر.

هۆکاری ئەوە بوو کاتێك مۆعیزئەلدەولە لەڕێگەی وشکانییەوە هێرشی کردە سەر بەسرە، قەرەمتییەکان ئەم کارەی ئەویان بەقێزەون لەقەڵەمدا و مۆعیزئەلدەولە بەو شێوەیە وەڵامی دانەوە کەپێشتر ئامارژەمان پێدا. یوسف کوڕی وەجیە زانی قەرەمتییەکان لەمۆعیزئەلدەولە ڕەمیان کردووە، نامەیەکی دیکەی بۆ ئەوان نووسی و تەماحی گرتنی بەسرەی خستە بەردەمیان و داوای لێکردن لەڕێگەی وشکانییەوە هاوکاری بکەن. ئەوانیش بەهێزێکی زۆر هاوکاری کوڕی وەجیەیان کرد و کوڕی وەجیە لەڕێگەی دەریاوە بەرێکەوت. موهەلبی وەزیر لەم هێرشە ئاگادار بوویەوە و چوونکە لەئەهواز کێشەی نەمابوو، بەخێرایی بەرەو بەسرە ئەسپی تاودا و پێش گەیشتنی کوڕی وەجیە گەیشتە شارەکە و بەسرەی لێوانلێو لەسەرباز کرد. مۆعیزئەلدەولە بەناردنی سەرباز و خواردەمەنی هاوکاری کرد. ئەو چەند ڕۆژێك لەگەڵ کوڕی وەجیە جەنگی و سەرئەنجام کوڕی وەجیە شکستی خوارد و موهەلبی کەشتییەکان و سامان و کەرەستەکانی جەنگی سوپاکەی تاڵان کرد.

### مەرگی مەنسوری عەلەوی و خەلافەتی مۆعیزی کوڕی

لەکۆتایی شەوال/ هەژدەی مارسی ئەم ساڵە مەنسور باللە باوکی تاهیر ئیسماعیل کوڕی قائیم باوکی قاسم محەممەد کوڕی عوبەیداللەی مەهدی مرد. خەلافەتی ئەو حەوت ساڵ و شانزە ڕۆژ درێژەی کێشا و ساڵەکانی ژیانی لەسی و نۆ کۆتایی هات. ئەو وتاردەرێکی زمان پاراو بوو و لەتازەگەرەکانی ڕۆژگاری

خۆی. جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو لەگەڵ باوکی یەزیدی خارجی و کەسانی دیکە شایەتی بوێری و بیرمەندی ئەوە.

چۆنیەتی مەرگی ئەو بەم شێوەیە: ئەو ڕۆشتە سەفاقوس و تونس و لەوێوە ڕۆشتە قابس و پەیامی بۆ خەڵکانی دوورگەی جەربە نارد و پێشنیاری فەرمانبەری خۆی پێکردن. خەڵکی جەربە رازی بوون. ئەو ژمارەیەك لەپیاوە گەورەکانی ئەوانی بەبارمتە گرت و گەڕایەوە. چوون و گەڕانەوەی ئەو یەك مانگی خایاند. ئەو لەو کاتەدا مەعدی کوڕی وەك جێگری خۆی دیاریکردبوو. کاتێك رەمەزان/ ژانویە گەیشت، مەنسور بۆ گەڕان ڕۆشتە شاری جەلەولا. لەم شارە میوەی فراوان دەبینرا و تورەنج (میوەیەکە هاوشێوەی پرتەقاڵ) گەورەی بێ وینە کەیەك وشتر تەنیا دەیتوانی چوار تورەنج هەڵگرێت. ئەو لەم تورنجانەی هێنا بۆ کۆشکەکەی. مەنسور کەنیزێکی جوان و بەڕێزی بوو. ئەم کەنیزە کاتێك تورەنجەکانی بینی، پێیان دڵخۆش و داوای لەمەنسور کرد ئەو لەناو لق و گەڵاکانی تورنجەکە ببینێت. مەنسور رازی و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ڕۆشتە تورنجستانەکەی (باخی داری تورەنج) و چەند ڕۆژێکی لەوێ بەسەر برد و دواتر بۆ مەنسورییە گەڕایەوە. لەرێگە گرفتاری تۆفانێکی سەخت و سەرما و باران بوویەوە. ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا و مەنسور خۆڕاگری کردە پیشە. بەفرێکی زۆر باری و ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵیکردبوو. دەستەیەك لەهاوەڵانی مردن و مەنسور بەقورسی نەخۆش کەوت. کاتێك گەیشتە مەنسوریە، ویستی بڕواتە گەرماو. ئیسحاق کوڕی سلێمانی ئیسرائیلی، پزیشکەکەی، ڕێگەی ڕۆشتن بۆ گەرماوی لێگرت بەڵام مەنسور رازی نەبوو و ڕۆشتە ناو گەرماوەکە و گەرمای جەستەی لەدەستدا و گرفتاری بێ خەوی بوو. ئیسحاق لەتیمار کردنی بەردەوام بوو بەڵام ئەو لەبێ خەوی رەنجی دەکێشا. نەخۆشییەکەی تەشەنەی کرد تا ئەوەی بەیەکێك لەخزمەتکارەکانی وت: ئایا لەم شارە جگە لەئیسحاق پزیشکی دیکەمان نییە، لەم نەخۆشییە رزگارم بکات؟ ئەو بەمەنسوری وت: گەنجێك هەیە کەتازە بۆتە پزیشك بەناوی ئیبراهیم. مەنسور بانگی کرد و لەبێ خەوی خۆی سکاڵای بەرز کردەوە. ئیبراهیم کەمێك دەرمانی خەوهێنەری تێکەڵ کرد و خستییە ناو

شووشـەیەك و شووشـەكەی خـستە نـاو ئـاگر و داوای لەمەنـسور كـرد بـۆنی پێـوە بكات. مەنسور بەبۆن كردنی دەرمانەكان خەوی لێكەوت.

ئیبراهیم شـادمان لـەبارەگای مەنـسور گەڕایـەوە و مەنـسور خـەوتبوو. ئیـسحاق هات و داوای مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووری كرد. پێیان وت: مەنسور خەوتووە. ئیسحاق وتـی: ئەگـەر كارێكیـان بـۆ كـردووە تـا بخـەوێت، بەدڵنیاییـەوە مـردووە. ڕۆشـتنە سەرسـەری و بینیـان مـردووە. ئـەویان لەكۆشـكەكەی بـەخاك سـپارد و ویـستیان ئیـبراهیم بكـوژن بـەلاّم ئیـسحاق وتـی: تـاوانی ئیـبراهیم نییـە. ئـەو مەنـسوری وەك پزیـشكەكان دەرمـان كـرد بـەلاّم سەرچـاوەی نەخۆشـییەكەی ئـەوی نـەدەزانی و ئێوەیش تێنەگەیشتن. من دەمویست گەرمای سروشتی جەستەی بەرز بكەمەوە تا خەو زۆری بۆ بێنێت و كاتێك بەو دەرمانانە خەوی لێكەوت، دڵنیابووم كەمردووە.

دوای مەرگی مەنسور، مەعدی كوڕی بەنازناوی مۆعێزئەلدین الله هاتە سەركار و لەحـەوتی زیحەججـە/ بیـست و شەشـی ئاوریـل بـەڕێوەبردنی كاروبارەكـانی گرتەدەست و مۆڵەتی هاتنە ژووری بەخەڵكاندا و لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت و خەڵكان هاوشێوەی خەلیفە سلاّویان بۆنارد. مەعد لەم كاتەدا گەنجێكی بیست و چوار ساڵە بوو.

لەسـاڵی ٣٤٦/٩٥٧ زایـینی بەسـەر كێـوی ئـەوراس سـەركەوت و سـەربازەكانی خۆی بلاّو كردەوە. ئەم كێوە پەناگەی شۆڕشیەكان بوو. مناڵـەكانی كـەملان، هـۆزی مەلیلە و دوو هۆز لەهەوارە لەكاتی هاتنە سـەركاری مـۆعێز، ملكەچی فەرمانـەكانی نەبوون و لەم كێوە ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەوان بەناچاری ملكەچی خۆیان نیشاندا و لـەگڵ ئـەو بـۆ شـارەكە گەڕانـەوە. مـۆعێز فـەرمانی بەنوێنـەركانی خۆیـدا چاكەیان لەگەڵدا بكەن. هەموویان لەگەڵ مۆعێز لەكێوەكـە هاتنـەخوار. مـۆعێز ڕێـزی گـرتن و بەم شێوەیە پێگـەی بـەرز بوویـەوە. محەممـەد كـوڕی خـزری زەنـاتی، برای مەعبەد لەو كەسانە بوو داوای ئەمانی لەمۆعێز كرد و پێی بەخشرا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەرەبیع الاوەل/ ژوئیەی ئەم ساڵە، موعیزئەلدەولە، سەد و پەنجا قامچی لەوەزیرەکەی، باوکی محەممەدی موهەلبیدا و پاسەوانی بۆ ماڵەکەی دانا. بەڵام ئەوی لەوەزارەت دوورنەخستەوە. موعیزئەلدەولە لەبەر چەندین کار ڕقی ئەوی لەدڵ گرتبوو و لەبەر ئەمە قامچی بارانی کرد.

لەرەبیع الاخر/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە لەسێشەممە بازاری بەغداد ئاگرێکی گەورە کەوتەوە و ژمارەیەکی زۆر لەکەل و پەلی خەڵکان سووتا کەژماردنیان ئەگەری نییە.

لەم ساڵەدا پاشای ڕۆم دەستی بەسەر شاری سەروجدا گرت و دانیشتووانی شارەکەی ئەسیر و سامانەکانی زەوت کرد و مزگەوتەکانی سووتاند.

لەم ساڵەدا ڕۆکن ئەلدەولە لەرەی ڕۆشتە تەبەرستان و جورجان و لەوێوە بۆ کەنارەکانی ئەسار بەرێکەوت و لەم سەرزەمینە مایەوە. ڕۆکن ئەلدەولە دەستی بەسەر ئەم سەرزەمینانەدا گرت و دواتر بۆ ڕەی گەڕایەوە و حەسەن کوڕی فیرزان و عەلی کوڕی کامەی وەك جێگری خۆی لەجورجان دەستنیشان کرد. کاتێك ڕۆکن ئەلدەولە لەو سەرزەمینانە گەڕایەوە، وەشمگیر مەبەستی ئەو ناوچانەی کرد. سوپاکەی ڕۆکن ئەلدەولە ڕووبەڕووی شکست بوویەوە و وەشمگیر دەستی بەسەر ئەو ناوچانەدا گرت.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن عەلی کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە یا هەمان فەخر ئەلدەولە چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی عەلی ئیسماعیل کوڕی محەممەد کوڕی ئیسماعیلی سەفار، نەحوی حەدیس بێژ کە لەهاوەڵانی موبەرید و لەساڵی ٨٦١/٢٤٧ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا، مرد. ئەو حەدیسی زۆری لەبەر بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و دووی کۆچی( ٩٥٣ زایینی )

## هەڵاتنی دەیسەم لەئازەربایەجان

لەم ساڵەدا دەیسەم کوڕی ئیبراهیم باوکی سالیم لەئازەربایەجان هەڵات. پێشتر سەبارەت بەچۆنیەتی زاڵبوونی ئەو بەسەر ئەم سەرزەمینە قسەمان کرد.

چۆنیەتی هەڵاتنی ئەو بەم شێوە بوو: ڕۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە یەکێك لەسەرکردەکانی دەیسەمی بەناوی عەلی کوڕی مەیسەکی گرت. ئەو لەزیندان هەڵات و مەبەستی چیاکانی کرد. ئەو دەستەیەکی کۆکردەوە و ڕۆشتە لای وەهسوزان برای مەرزوبان. ئەم دووانە پەیمانیان بەست پێکەوە دژی دەیسەم بجەنگن.

دواتر مەرزوبان بەسەر قەلاّی سومەیرەم – ئاماژەی پێدەدرێت– زاڵبوو. نامەکانی مەرزوبان بەبراکەی و عەلی کوڕی مەیسەکی دەگەیشت کەرزگاری بووە. عەلی کوڕی مەیسەکی نامەی بۆ دەیلەمییەکان نووسی و ڕێزی گرتن. دەیسەم لەرزگار بوونی مەرزوبان ئاگادار نەبوو و گومانی دەکرد تەنیا وەهسوازن وعەلی کوڕی مەیسەکی لەگەڵی دەجەنگن.

دەیسەم وەزیرێکی بوو بەناوی باوکی عەبدوللەی نەعیمی. دەیسەم چاوی تەماحی بڕییە سامانەکەی و ئەوی گرت و دەبیری نەعیمی وەك وەزیر لەجێگەی ئەو دانا. نەعیمی هەموو ڕێگەیەکی دەگرتەبەر تا ئەوەی دەیسەم دەیخوازێت، پێی بدات بەو مەرجەی وەزیر بەخودی ئەو بسپێرێت تا بتوانێت سامانەکەی لێ بستێنێت. دەیسەم دەستی وەزیر ئاوەڵا کرد و دەبیرەکەی نەعیمی بۆ ئەو گەڕاندەوە و پێگەکەی (وەزیری) پێ بەخشییەوە.

دەیسەم ڕۆشتە سەفەر و نەعیمی لەئەردەبیل بەجێهێشت تا سامانەکانی وەزیر زەوت بکات. نەعیمی، وەزیری کوشت و لەگەڵ سامانەکانی، پەیوەستی عەلی کوڕی مەیسەکی بوو. دەیسەم لەنزیك زەنجان لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و بۆ ئەردەبیل گەڕایەوە بەلاّم لەم کاتەدا دەیلەمییەکان ئالاّی شۆڕشیان بەرز کردەوە و

ناچار بوو هەمووی سامانەکانی لەناو ئەواندا بلاو بکاتەوە. دەیسەم ئاگادار بوویەوە عەلی کوڕی مەیسەکی لەگەڵ سوپایەکی کەم بەرەو ئەردەبیل بەرێکەوتووە. دەیسەم هێرشی کردەسەر و دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگان. دەیلەمییەکان پەیوەستی عەلی کوڕی مەیسەکی بوون ودەیسەم لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەکوردەکان بەرەو ئەرمەنستان هەلات. فەرمانڕەواکانی ئەرمەنستان پارەیان خستەبەردەست تا بژێوی ژیانی خۆی دابین بکات.

لەم کاتەدا دەیسەم ئاگادار بوویەوە مەرزوبان لەقەلاَی سومەیرەمەوە هێرشی کردۆتە سەر ئەردەبیل و ئازەربایەجانی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆیەوە و سوپایەکی بۆ گرتنی ئەو (دەیسەم) ڕەوانە کردووە. بەمشێوەیە چیتر نەیتوانی لەئەرمەنستان بمێنێتەوە و بەرەو بەغداد کەوتەرێ و لەم ساڵەدا گەیشتە بەغداد. مۆعیزئەلدەولە چاوی پێی کەوت و رێزی گرت. دەیسەم لای ئەو بەخۆشی ژیانی بەسەر برد.

ماوەیەك دواتر بنەماڵە و هاوەلانی نامەیان بۆ نووسی و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ ئازەربایەجانیان پێکرد. ئەو لەساڵی ٣٤٣/٩٥٤ زایینی بەغدادی بەجێهێشت و داوای لەمۆعیزئەلدەولە کرد بەسوپایەك هاوکاری بکات بەلاَم مۆعیزئەلدەولە ئەو کارەی نەکرد چوونکە مەرزوبان لەگەڵ رۆکن ئەلدەولە پەیمانی ئاشتی و پەیوەندی خزمایەتی بەستبوو. مۆعیزئەلدەولە توانای ناسازگاری کردنی رۆکن ئەلدەولەی لەخۆیدا نەدەبینی. دەیسەم ڕۆشتە لای ناسرئەلدەولە کوڕی حەمدان لەموسڵ و داوای هاوکاری لێکرد بەلاَم ئەویش وەلاَمی نەدایەوە. دەیسەم روویکردە شام بۆ لای سەیف ئەلدەولە و تا ساڵی ٣٤٤/٩٥٥ زایینی لای ئەو مایەوە.

بەرێکەوت دەستەیەك لەباب الابواب (دەروازەی دەروازەکان) دژی مەرزوبان ئالاَی شۆڕشیان بەرز کرەوە. مەرزوبان بۆ سەرکەوت کردنی ئەوان بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێکەوت. یەکێك لەسەرکردە گەورەکانی کوردی ئازەربایەجان نامەی بۆ دەیسەم نووسی و داوای کرد بگەڕێتەوە تا بەهاوکاری یەك بەسەر ئازەربایەجاندا زاڵ بن. دەیسەم رێگەی ئازەربایەجانی گرتەبەر و شاری سەلماسی گرت. مەرزوبان سەرکردەیەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. دەیسەم رووبەرووی بوویەوە

و هاوەڵانی ئەو سەرکردەیە پەیوەستی دەیسەم بوون. سەردارەکەی مەرزوبان هەڵات و دەیسەم لەسەڵماس مایەوە.

کاتێک مەرزوبان شۆڕشییەکانی سەرکوت کرد، بۆ ئازەربایەجان گەڕایەوە و کاتێک لەسەڵماس نزیک کەوتەوە، دەیسەم شارەکەی بەجێهێشت و بەرەو ئەرمەنستان هەڵات و ڕۆشتە لای کوڕی دەیرانی و کوڕی حاجیق چوونکە هەردووکیانی بەکەسانی بڕواپێکراو دەزانی. مەرزوبان نامەی بۆ کوڕی دەیرانی نووسی تا دەیسەم بگرێت. کوڕی دەیرانی سەرەتا رازی نەبوو بەڵام دواتر لەترسی مەرزوبان دەیسەمی گرت. دواتر مەرزوبان فەرمانی پێدا دەیسەم بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. دەیرانی سەرەتا بەڕەوانە کردنی ئەو رازی نەدەبوو بەڵام دواتر رادەستی مەرزوبانی کرد. کاتێک مەرزوبان ئەوی گرت، کاسەی چاوی دەرهێنا و زیندانی کرد. کاتێک مەرزوبان مرد، یەکێک لەهاوەڵانی ئەو دەیسەمی کوشت لەترسی ئەوەی نەکا ئاژاوە سەرهەڵبدات.

## زاڵبوونی مەرزوبان لەسومەیرەم

پێشتر ئاماژەمان بەئەسیر کران و زیندانی کرانی مەرزوبان لەسومەیرەمدا.

چۆنیەتی رزگاری بوونی ئەو بەم شێوە بوو: دایکی، کچی جوستان کوڕی وەهسوزانی شەهریار، دەستەیەکی بۆ رزگار کردنی مەرزوبان راسپارد. ئەم دەستەیە هاوشێوەی بازرگان ڕۆشتنە سومەیرەم. ئەوان وایان نیشاندا مەرزوبان کەل و پەلی گرانبایی لێسەندوون و پارەکەی نەداوە. ئەو دەستەیە ڕۆشتنە لای بەشیری ئەسفار، کارگوزاری سومەیرەم و باسی ستەمەکانی مەرزوبانیان کرد. ئەوان داوایان لەبەشیر کرد بیانباتە لای مەرزوبان بۆ ئەوەی دەستنووسێکی لێ وەربگرن تا بیبەنە لای دایکی و پارەکەی خۆیان لەو وەربگرن. بەشیر دڵی بۆیان سووتا و ئەوانی بردە لای مەرزوبان. ئەوان داوای پارەکەی خۆیان کرد. مەرزوبان حاشای لەم قەرزانە کرد. یەکێک لەوان چاوێکی لێداگرت. مەرزوبان هەستی بەمەبەستەکەی ئەوان کرد و قەرزەکەی پشتراست کردەوە و وتی: دەبێت چەند و چۆنی قەرزەکەی ئێوەم بیربکەوێتەوە چوونکە لەئێستادا بڕ و ئەندازەکەی نازانم.

ئەوان لای ئەو مانەوە و پارەیان بەبەشیری ئەسفار و سەربازەکاندا وبەڵێنیاندا ئەگەر بتوانن قەرزەکەی خۆیان لەمەرزوبان وەربگرنەوە، بڕە پارەیەکی زۆریان پێدەدەن. لەبەر ئەمە بێ وەرگرتنی مۆڵەت دەڕۆشتنە ناو قەڵاکە. بەم شێوەیە توانیان بڕەپارەیەکی زۆر و هەواڵەکانی دایکی بەمەرزوبان بگەیێنن.

بەشیری ئەسفار غیلمانێکی[1] جوان روخساری بوو کەقەڵغان و زووبینەکەی بەشیری دەهێنا. مەرزوبان چاکە و خۆشەویستی زۆری بۆ ئەم کوڕە نیشان دەدا و لەو پارانەی دایکی بۆی دەنارد، بڕێکی زۆری بەودەبەخشی و بەمشێوەیە توانی ئەو لەخۆی نزیك بکاتەوە. ئەم کوڕە زرێ و سەوهانی بۆ مەرزوبان هێنا و مەرزوبان زنجیرەکەی خۆی سەوهان کرد. مەرزوبان و کوڕەکە و ئەو دەستەی بۆ رزگار کردنی ئەو هاتبوون، بڕیاریاندا هەمان شەو بەشیری ئەسفار بکوژن.

بەشیری ئەسفار حەفتەی یەك رۆژ سەردانی مەرزوبانی دەکرد. ئەو سەیری زنجیرەکەی دەکرد و دڵی دەدایەوە و دەگەڕایەوە. کاتێك رۆژی دیاریکراو گەیشت، یەکێك لەبازرگانەکان لای مەرزوبان دانیشت و یەکیتریان لای زیندانوانەکە و ئەوانی دیکە لای دەرگای قەڵاکە دانیشتن و چاوەڕوانی هاواری ئەو دوو کەسە بوون. بەشیر ڕۆشتە لای مەرزوبان. مەرزوبان بەهێمنی لەگەڵی دوا و داوای لێکرد ئازادی بکات و لەبەرابەردا سامان و زەوی وەربگرێت. بەشیر رازی نەبوو و وتی: هەرگیز خیانەت لەرۆکن ئەلدەولە ناکەم. مەرزوبان قاچی لەزنجیرەکە دەرهێنا و ڕۆشتە لای کوڕەکە و قەڵغان و زوبینەکەی لێ وەرگرت و لەبەشیر نزیك کەوتەوە و کوشتی. ئەو بازرگانەی لای ئەو دانیشتبوو، هاوکاری کرد. لەم کاتەدا زیندانوانەکە هات و مەرزوبان ئەویشی کوشت. کەسانی لای دەروازەکە هاتنە لای مەرزوبان. سوپای ئەم قەڵایە بڵاوەی لێکردبوو و کاتێك دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە، کۆبوونەوە و کاتێك بینیان هاوەڵەکانیان و بەشیر کوژراون، داوای ئەمانیان کرد. مەرزوبان ئەمانی پێبەخشین و ئەوانی لەقەڵاکە هێنایەدەر و هەموو پیاوەکان، لەهاوەڵانی مەرزوبان تا کەسانی دیکە لەدەوری کۆبوونەوە. بەم شێوەیە

---

[1]- کوڕی جوان و لووس و خەساو کە لەکۆندا فەرمانڕەوکان بەمەبەستی رابواردن و کارپێکردن لەناو کۆشك و بارەگاکانی خۆیان رایاندەگرت. وەرگێر

شوێنکەوتەکانی زیادی کرد و دەستی بەسەر ئازەربایەجاندا گرت کەپێشتر ئامارژەمان پێدا.

## ڕۆشتنی باوکی عەلی بەرەو ڕەی

کاتێك بەسەرهاتی وەشمگیر و ڕۆکن ئەلدەولە بەوە کۆتایی هات کەئامارژەمان پێدا، وەشمگیر نامەیەکی بۆ ئەمیر نوح نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. ئەمیر نوح نامەی بۆ باوکی عەلی کوڕی موحتاج نووسی و فەرمانی پێدا لەگەڵ سوپای خوراسان بەرەو ڕەی بڕوات و دژی ڕۆکن ئەلدەولە بجەنگێت. باوکی عەلی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێکەوت. وەشمگیر پەیوەستی بوو و هەردووك لەرەبیع الاوەل/ جولای ئەم ساڵە ڕێگەی ئەو شارەیان گرتەبەر.

ڕۆکن ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و زانی ناتوانێت لەبەرابەر ئەو سوپایە خۆڕاگری بکات. بەباشی زانی لەیەك بەرەوە لەگەڵ دوژمن بجەنگێت. ئەو لەتەبەروك ڕووبەڕووی سوپای خوراسان بوویەوە و باوکی عەلی چەند مانگێك لەو ناوچەیە مایەوە و جەنگا بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت و زۆربەی چوارپێکانی خۆی لەدەستدا. زستان هات و چیتر خوراسانییەکان هێز و توانای خۆیان لەدەستدا و باوکی عەلی بەناچاری بەئاشتی ڕازی بوو. بۆ ئەم مەبەستە نوێنەرێك لەنێوان ئەوان هاتوچۆی دەکرد. ئەم نوێنەرە باوکی جەعفەری خازن، نووسەری کتێبی (زیج الصقائح) و شارەزای زانستی بیرکاری بوو. محەممەد کوڕی عەبدولڕەزاق – کەپێشتر باسمان کرد– پێشنیاری ئەوی کرد. هەردووك بەمەرجەکانی ئاشتی ڕازی بوون و بڕیاردرا ڕۆکن ئەلدەولە ساڵانە دووسەد هەزار دینار بدات و بەم شێوەیە باوکی عەلی بۆ خوراسان گەڕایەوە.

وەشمگیر نامەیەکی بۆ ئەمیر نوح نووسی و لەم بارودۆخە ئاگاداری کردەوە و پێی وت باوکی عەلی لەجەنگ دژی ڕۆکن ئەلدەولە هەموو هێز و توانای خۆی بەکار نەبردووە و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ڕۆکن ئەلدەولە واژۆ کردووە. ئەمیر نوح ڕقی باوکی عەلی لەدڵ گرت. کاتێك باوکی عەلی لەسوپاکەی ڕۆکن ئەلدەولە دوور کەوتەوە، ڕۆکن ئەلدەولە هێرشی کردە سەر وەشمگیر. وەشمگیر بۆ ئەسفەراین هەڵات و ڕۆکن ئەلدەولە دەستی بەسەر تەبەرستاندا گرت.

## لابردنی باوکی عەلی لەخوراسان

کاتێك هەواڵی گەڕانەوەی باوکی عەلی لەڕەی بەئەمیر نوح گەیشت، توڕە بوو. وەشمگیریش نامەیەکی بۆ ئەمیر نوح نووسی و باوکی عەلی بەتاوانبار زانی. ئەمیر نوح نامەیەکی بۆ باوکی عەلی نووسی و ئەوی لەفەرمانڕەوایەتی سوپای خوراسان لابرد. نامەیەکی دیکەی بۆ سەرکردەکانی دیکە نووسی و لەم هەواڵە ئاگاداری کردنەوە و باوکی سەعید بەکر کوڕی مالکی فەرغانی وەك فەرماندەی سوپای خوراسان هەڵبژارد. باوکی عەلی نوێنەری بۆ لای ئەمیر نوح نارد و داوای بەخشینی کرد. دەستەیەك لەگەورەکانی نەیشابوریش نامەیان بۆ ئەمیر نوح نووسی و سەبارەت بەباوکی عەلی نێوەنجێگەرییان کرد و داوایان لێکرد چاوپۆشی لەلابردنی ئەو بکات بەڵام وەڵامیان نەدرایەوە و باوکی عەلی ئەو پێگەی لەدەستدا. ئەویش ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر و لەنەیشابور بەناوی خۆی وتاری خوێندەوە.

ئەمیر نوح نامەی بۆ وەشمگیر و حەسەن کوڕی فیرزان نووسی و داوای لێکردن پەیمانی ئاشتی لەگەڵ یەك واژۆ بکەن و لەگەڵ ئەوکەسانە بجەنگن کەدژی حکومەت ئالأی شۆڕش بەرز دەکەنەوە. ئەو دوانە، پەیمانی ئاشتییان بەست. کاتێك باوکی عەلی زانی خەڵکان لەگەڵ ئەمیر نوح دژی ئەو یەکیان گرتووە، نامەیەکی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە نووسی تا بڕواتە لای چوونکە دەیزانی چیتر ناتوانێت لەخوراسان بمێنێتەوە و توانای گەڕانەوە بۆ لای سەغانییەکانی نییە. بەناچاری نامەی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە نووسی و داوای لێکرد بڕواتە لای. ڕۆکن ئەلدەولە رازی بوو.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەبیست و یەکی شوبات/ فەوریەی ئەم ساڵە لەکەنارەکانی عێراق هێرشی کوولە دەستی پێکرد و چەند ڕۆژێك درێژەی کێشا و زیانێکی زۆری لەدانەوێڵەی ئەو دیارەدا. لەئەهواز، موسڵ، جەزیرە، شام و سەرزەمینەکانی دیکە ئەم بەڵایە بینرا و دانەوێڵەی ئەو سەرزەمینانەیش بەرهێرشی کوولەکان کەوتن.

لەم ساڵەدا نێردراوانی خەلیفە لەخوراسان گەڕانەوە. خەلیفە ئەوانی ناردبوو تا

لەنێوان ڕۆکن ئەلدەولە و ئەمیر نوح، فەرمانڕەوای خوراسان ئاشتی سەقامگیر بکەن. کاتێك نێردراوەکان گەیشتنە حیلوان، کوڕی باوکی شەوك لەگەڵ کوردەکانی هاوڕێی هێرشی کردە سەریان و سامانی ئەوانیان برد. کاروانەکە تالان کرا و نێردراوان ئەسیر کران و دواتر ئازادیان کردن. مۆعێزئەلدەولە سوپایەکی بۆ حیلوان نارد و کوردەکانی سەرکوت کرد و گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا دوو سالاری حاجییەکان، باوکی حەسەن محەممەد کوڕی عەبدوللە و باوکی عەبدوللە ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی یەحیا- هەردووك عەلەوی بوون- لەگەڵ حاجییەکان ڕۆشتن و لەنێوان ئەم دووانە و سوپای میسر کەهاوەڵانی کوڕی توغج بوون، جەنگێکی قورس کەوتەوە و ئەم دوو کەسە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و لەمەککە بەناوی مۆعێزئەلدەولە وتار خوێندرایەوە. کاتێك ئەم دووانە لەمەککە هاتنەدەر، سوپای میسر شوێنیان کەوت و جەنگی دەستپێکرد بەڵام دووبارە ڕووبەڕووی شکست بوونەوە.

لەڕەبیع الاوەل/ جولای ئەم ساڵە عەلی کوڕی باوکی فەهم داود باوکی قاسم، باوەگەوڕێی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی تەنوخی قازی مرد. ئەو ئاشنای بیروباوەڕی موعتەزیلە و شێعر بوو.

لەرەمەزان/ ژانویەی ئەم ساڵە شەریف باوکی عەلی عومەر کوڕی عەلی عەلەوی کوفی بەهۆی نەخۆشی پەرکەمەوە کۆچی دوایی کرد.

لەشەوال/ فەوریەی ئەم ساڵە باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی سلێمان کوڕی فەهدی موسڵی مرد.

لەم ساڵەدا باوکی فەزڵ عەباس کوڕی فەسانجس بەهۆی سك ئێشەوە مرد و جەنازەی بێ گیانی ئەویان بردە کوفە و لەحەرەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخاکیان سپارد. دوای خۆی کوڕەکەی باوکی فەرەج، کاروباری دیوانی گرتەدەست و هاوشێوەی باوکی دەجوولایەوە.

لەزیقەعدە/ مارسی ئەم ساڵە، بیدعە، گۆرانیبێژی بەناوبانگ، ناسراو بەبیدعەی حەمدونیە لەنەوەد و دوو ساڵی مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و سێی کۆچی( ٩٥٤ زایینی )

## بەسەرهاتی باوکی عەلی کوڕی موحتاج

پێشتر سەبارەت بەباوکی عەلی قسەمان کرد. کاتێك نامەی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە نووسی و داوای لێکرد مۆڵەتی پێبدات برواتە لای و ڕۆکن ئەلدەولە مۆڵەتی پێدا، بەرەو ڕەی بەڕێکەوت. ڕۆکن ئەلدەولە چاوی پێی کەوت و ڕێزی گرت و تورکەکان بۆ خۆی و هاوەڵانی میوانییان ڕێکخست. باوکی عەلی داوای لەڕۆکن ئەلدەولە کرد فەرمانڕەوایەتی خوراسانی لەخەلیفە بۆ وەربگرێت. ڕۆکن ئەلدەولە لەمبارەوە نامەیەکی بۆ مۆعیزئەلدەولە نووسی و مۆعیز ئەلدەولە فەرمانی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی بۆ باوکی عەلی لەخەلیفە وەرگرت و ژمارەیەك لەسوپاکەی بۆ هاوکاری کردنی ڕەوانە کرد. باوکی عەلی بەرەو خوراسان بەڕێکەوت و دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت و لەوێ و لەهەر شوێنێکی دیکەی خوراسان کەدەستی بەسەردا دەگرت، بەناوی خەلیفە موتیع وتاری دەخوێندەوە. پێشتر لەو سەرزەمینە بەناوی خەلیفە وتار نەدەخوێنرایەوە.

لەم کاتەدا نوح مرد و دوای ئەو عەبدولمەلیکی کوڕی هاتە سەرکار.

کاتێك عەبدولمەلیك لەسەر تەختی باوکی دانیشت، بەکر کوڕی مالکی لەبوخاراوە بەرەو خوراسان ڕەوانە کرد و فەرماندەیی سوپای خوراسانی پێ سپارد و فەرمانی پێدا باوکی عەلی لەخوراسان دەربپەڕێنێت. ئەو لەگەڵ سوپاکەی هێرشی کردە سەر باوکی عەلی. هاوەڵان و سوپاکەی باوکی عەلی لەدەوری بڵاو بوونەوە و باوکی عەلی مایەوە و دووسەد کەس و ژمارەیەك لەدەیلەمییەکان کەهاوکارییان دەکرد. باوکی عەلی بەناچاری هەڵات و ڕۆشتە لای ڕۆکن ئەلدەولە. ڕۆکن ئەلدەولە ئەوی لای خۆی جێگە کردەوە و کوڕی مالك دەستی بەسەر خوراساندا گرت و لەنەیشابور مایەوە و شوێنپێی هاوەڵانی باوکی عەلی هەڵگرت.

**مەرگی ئەمیر نوح کوڕی نەسر و فەرمانڕەوایەتی عەبدولمەلیکی کوڕی**

لەرەبیع الاخر/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ئەمیر نوح کوڕی نەسر بەنازناوی ئەمیر حەمید مرد. ئەو خۆش کردار و رووخۆش بوو. کاتێك مرد، عەبدولمەلیکی کوڕی جێگەی گرتەوە. نوح پێشتر بەکر کوڕی مالکی وەك سوپای خوراسان دیاریکردبوو. پێش ئەوەی بەکر بەرەو خوراسان بەرێکەوێت، نوح مرد و بەکر بۆ خزمەت کردنی عەبدولمەلیك، قۆڵی لێ هەڵماڵی. کاتێك بارودۆخ بۆ عەبدولمەلیك سەقامگیر بوو، فەرمانی بەبەکردا بەرەو خوراسان بەرێکەوێت. بەکر هێرشی کردە سەرخوراسان و ئەنجامەکەی بەوە کۆتایی پێهات کەئاماژەمان پێدا.

## جەنگی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان

لەرەبیع الاوەل/ جولای ئەم ساڵە سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان لەگەڵ رۆمییەکان جەنگی و کوشتی و بڕی و ئەسیری کرد. یەکێك لەو کەسانەی بەدەستی ئەو کوژرا، قوستەنتین کوڕی دوموستوق بوو. مەرگی ئەو هەم بۆ رۆمییەکان دژوار بوو هەم بۆ دوموستوق. دوموستوق، سوپای رۆم، روس، بولغار و سوپاییەکانی دیکەی کۆکردەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر سنورەکانی کرد. سەیف ئەلدەولە بۆ جەنگی ئەو ئەسپی غاردا. دوو سوپا لەشەعبان/ نۆڤەمبەر لەحەدەس رووبەرووی یەکبوونەوە. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و دوو سوپا خۆڕاگرییان کرد و سەرئەنجام موسوڵمانان سەرکەوتن و رۆمییەکان بڵاوەیان لێکرد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا. زاواکەی دوموستوق و کچە زاکەی و ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەکانی ئەسیر کران و دوموستوق بەشێوەیەکی نهێنی هەڵات.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەخوراسان و چیاکان (لوڕستان و کوردستان) نەخۆشی کۆلێرا دەرکەوت و ژمارەیەکی فراوان لەخەڵکان گیانی خۆیان لەدەستدا.

لەم ساڵەدا ئەبرعاجی لەفەرماندەیی پاسەوانەکان دوورخرایەوە و سێسەد هەزار درهەمیان لێسەند و بەك بەیك، فەرماندەی تورکەکان جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەم ساڵەدا ڕۆکن ئەلدەولە لەگەڵ باوکی عەلی کوڕی موحتاج هێرشی کردە سەر جورجان و بێ جەنگ دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. وەشمگیر لەجورجانەوە بەرەو خوراسان بەرێکەوت.

لەم ساڵەدا لەنێوان هاوەڵانی مۆعێزئەلدەولە و هاوەڵە میسرییەکانی کوڕی توغج لەمەککە، جەنگ ڕوویدا و هاوەڵانی مۆعێزئەلدەولە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و لەوتاری مەککە و حیجاز سەرەتا ناوی ڕۆکن ئەلدەولە و مۆعێزئەلدەولە و کوڕەکەی عێزئەلدەولە بەختیار و دواتر ناوی کوڕی توغج دەبرا.

لەرەجەب/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە مۆعێزئەدەولە، سەبوکتەکینی لەگەڵ سوپایەکی تەیار بەبەردهاوێژەکان، بۆ گرتنی شارەزوور ڕەوانە کرد. سەبوکتەکین تا موحەرەمی ٣٤٤/ ئاوریلی ٩٥٥ لەو دەڤەرە مایەوە بەلاّم نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت چوونکە – بەخواستی خوا ئاماژەی پێدەدەین– هەواڵی پێگەیشت کەسوپای خوراسان بەرەو ڕەی بەرێکەوتووە و لەموحەرەم/ ئاوریل ڕۆشتۆتە ناو ئەو شارە.

لەشەوال/ ژانویەی ئەم ساڵە باوکی حسەین محەممەد کوڕی عەباس کوڕی وەلید ناسراو بەکوڕی نەحوی فەقیە، مرد. هەروەها لەشەوال/ ژانویەی ئەم ساڵە باوکی جەعفەر محەممەد کوڕی قاسمی کەرخی کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و چواری کۆچی( ٩٥٥ زایینی )

## نەخۆشی مۆعیزئەلدەولە و کرداری کوڕی شاهین

مۆعیزئەلدەولە لەزیقەعدەی ٣٤٣/ فەوریەی ٩٥٥ زایینی گرفتاری نەخۆشی فریافسمس (قریاقسیس) بوو. لەم نەخۆشییەدا نێرینەی پیاو بەردەوام ئازارێکی کوشندەی لەگەڵدایە و دەمارەکانی دەئاوسێت. مۆعیزئەلدەولە لەکاتی نەخۆشی سستی لەخۆی نیشان دەدا، خەڵکان وتاری جۆراوجۆریان هێنایە سەرزمان بارودۆخی بەغداد شڵەژا تا ئەوەی مۆعیزئەلدەولە لەگەڵ هەموو ئازارەکەی لەزیحەججە/ مارس سوار ئەسپ بوو و کاتێک موحەرەمی ٣٤٤/ ئاوریلی ٩٥٥ زایینی دەستیپێکرد، بەختیاری کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و کارەکانی دوای خۆی بەو سپارد و پێگەی ئەمیری ئەمیرەکانی پێبەخشی.

عیمران کوڕی شاهین ئاگادار بوویەوە مۆعیزئەلدەولە مردووە. لەم کاتەدا سامانێکی فراوان بەچەندین بازرگان لەئەهوازەوە بەرەو لای مۆعیزئەلدەولە بەرێکەوتبوو. عیمران هێرشی کردە سەر ئەم سامانە و فڕاندی. کاتێک مۆعیزئەلدەولە باش بوویەوە، لەمبارەوە نامەی بۆ شاهین نووسی. شاهین سامانەکەی گەڕاندەوە و تەنیا سامانی بازرگانەکانی بۆ خۆی هەڵگرت. بەم شێوەیە پەیمانی ئاشتی نێوان ئەوان کۆتایی پێهات. ئەم پێشهاتە لەمانگی موحەرەم/ ئاوریل ڕوویدا.

## هێرشی خوراسانییەکان بۆ ڕەی و ئیسفەهان

لەم ساڵەدا سوپای خورسان هێرشی کردە سەر ڕەی. ڕۆکن ئەلدەولە لەسەرەتای موحەرەم/ بیست و حەوتی ئاوریل لەڕەی نیشتەجێ بوو. نامەیەکی بۆ مۆعیزئەلدەولەی برای نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. براکەی سوپایەکی بەفەرماندەیی سەبوکتەکینی پەردەدار ڕەوانە کرد. لەولا، سوپای خوراسانییەکان

ـەرێگەی دەشتەوە بەرەو ئیسفەهان بەرێکەوتن. باوکی مەنسووری بویە کوڕی ڕۆکن ـئەلدەولە فەرمانڕەوایەتی ئیسفەهانی دەکرد.

ئەو کاتێك لەهاتنی سوپای خوراسانییەکان ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ گەنجینە و بنەماڵەی باوکی ئیسفەهانی بەجێهێشت و گەیشتە خانی لەنجان. فەرماندەی سوپای خوراسان محەممەد کوڕی ماکان بوو. سوپای خوراسان گەیشتە ئیسفەهان و ڕۆشتە ناو شارەکە. کوڕی ماکان شوێنپێی کوڕی بویەی هەڵگرت و خۆی گەیاندە گەنجینەکان و دەستی بەسەردا گرت و شوێن کوڕی بویە کەوت. لەم کاتەدا باوکی فەزڵ کوڕی عەمید، وەزیر ڕۆکن ئەلدەولە گەیشت و ڕووبەڕووی سوپای کوڕی ماکان بوویەوە بەڵام سوپاکەی شکستیان خوارد و بڵاوەیان لێکرد و سەربازەکانی کوڕی ماکان بەتاڵانییەکانەوە سەرقاڵ بوون.

کوڕی عەمید دەڵێت: لەم کاتەدا بەتەنیا مامەوە و بڕیارمدا پەیوەستی هاوەڵانم بم، بەڵام لەناکاو بیرم کردەوە: ئەگەر ئەو کارە بکەم، چۆن وەڵامی گەورەی خۆم بدەمەوە، پێی بڵێم منداڵ و بنەماڵە و سامانی حکومەتم بەجێهێشت و گیانی خۆم رزگار کرد! کەواتە مەرگم بەشیرینتر و باشتر لەرزگار کردنی گیانی خۆم بینی. وەستام و سەربازەکانی ماکان سەرقاڵی تاڵان کردنی سامانەکانی من و سوپاکەم بوون. لەم کاتەدا ژمارەیەك لەهاوەڵانی کوڕی عەمید لەدەوری کۆبوونەوە. دەستەیەکی دیکەش لەرێگەوە گەیشتن و هەموویان بەدەم هاوار کردنەوە هێرشیان کردە سەر سوپای خوراسان کەسەرقاڵی کۆکردنەوەی تاڵانییەکان بوون. بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەخوراسانییەکان کوژران و ئەسیر کران. کوڕی ماکان ئەسیر کرا و بردیانە لای کوڕی عەمید. کوڕی عەمید ڕێگەی ئیسفەهانی گرتەبەر و سوپاکەی کوڕی ماکانی لەوێ دەرپەڕاند و منداڵەکانی ڕۆکن ئەلدەولە و بنەماڵەکەی ئەوی دووبارە لەئیسفەهان جێگیر و سامانەکانی وەرگرتەوە.

دواتر ڕۆکن ئەلدەولە، نامەی بۆ بەکر کوڕی مالك سوپای خوراسان نووسی و هەردووك بەو مەرجەی ڕۆکن ئەلدەولە بڕێك پارە بدات و ڕەی و سەرزەمینی چیاکان لەژێر فەرمانی ئەودا بێت، پەیمانی ئاشتییان واژۆ کرد. ڕۆکن ئەلدەولە نامەیەکی بۆ مۆعیزئەلدەولەی برای نووسی تا خەڵات و ئاڵای فەرمانڕەوایەتی

خوراسان بۆ بەکر کوڕی مالك لەخەلیفە وەربگرێت و بۆی بنێرێت. ڕۆکن ئەلدەولە خەڵات و ئاڵای فەرمانڕەوایەتی بۆ کوڕی مالك نارد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەڕەی نەخۆشی کۆلێرا دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن. یەکێك لەمردووەکان باوکی عەلی کوڕی موحتاج بوو کەفەرماندەیی سوپای خوراسانی لەدەستدا بوو. کوڕەکەیشی مرد. جەنازەی بێ گیانی باوکی عەلییان بۆ سەغانییان بردەوە و سەرکردەکان لەگەڵ ئەو بۆ خوراسان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا کوردەکانی کەنارەکانی شاری ساوە هێرشیان کردە سەر کاروانی حاجییەکان و تاڵانیان کردن.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەدینوەند بانگەشەی پێغەمبەری کرد. کوشتیان.

پیاوێکی دیکە لەئازەربایەجان دەرکەوت وڕایگەیاند گۆشتی ئاژەڵەکان و بەرهەمی ئاژەڵەکان ناڕەوایە و بانگەشەی ئەوەی کرد شارەزای غەیبە. پیاوێك ئەوی وەك میوان بردە ماڵەکەی خۆی و ئاشی کەشکی چەوریداری دەرخواردا. کاتێك خواردی، خانەخوێ پێی وت: ئایا تۆ خواردنی گۆشت و بەرهەمە ئاژەڵییەکان بەناڕەوا نازانی و ئایا شارەزای غەیب نیت؟ وتی: بەڵێ. خانەخوێ وتی: ئەمە کەشکی پڕ چەوری بوو کەدەرخواردی تۆمدا و ئەگەر شارەزای غەیب دەبوویت، دەتتوانی لەمە ئاگادار ببیتەوە. خەڵکان چیتر باوەڕیان بەوتەکانی ئەو پیاوە نەدەکرد.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمانی ئومەوی فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، کەشتییەکی زۆر گەورەی دروست کرد کەپێشتر هاوشێوەی نەبینراوە. بەم کەشتییەدا کاڵاکانی بۆ سەرزەمینەکانی ڕۆژهەڵات نارد. ئەم کەشتییە لەدەریا ڕووبەڕووی کەشتییەکی دیکە بوویەوە کەنێردراوی سەقەلییە بۆ لای مۆعیزی عەلەوی بوو. ڕێگەیان لێگرت و سامانەکەیان تالان کرد. هەروەها دەستیان بەسەر نامەکانی مۆعیزی عەلەویدا گرت. مۆعیزئەلدەولە ئاگادار بوویەوە و چەندین کەشتی ئامادە کرد و حەسەن کوڕی عەلی، فەرمانڕەوای سەقەلەییەی وەك فەرماندە دەستنیشان و ئەوی بەرەو

ئاندۆلۆس ڕەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە مەریە و ڕۆشتنە ناو لەنگەرگەکە و هەموو کەشتییەکانی ئەم لەنگەرگەیان سووتاند و دەستیان بەسەر ئەو کەشتییە گەورەدا گرت. ئەم کەشتییە لەئەسکەندەرییە گەڕابوویەوە. کالاَ و کەنیزە گۆرانی بێژەکانی عەبدولرەحمان لەم کەشتییەدا دەبینران. سەربازی کەشتییەکان خۆیان گەیاندە وشکانی و ئەوەی بەردەستیان کەوت، خوێنیان ڕشت و بێ زیان بۆ مەهدییە گەڕانەوە. کاتێك عەبدولرەحمانی ئومەوی لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، چەندین کەشتی بۆ سەرزەمینەکانی ئەفریقییە ڕەوانە کرد و فەرمانی تالاَنکاری پێدان. سوپاکەی مۆعیز مەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەیان کرد و ئەوان بەناچاری بۆ کەشتییەکانی خۆیان گەڕانەوە و ڕێگەی ئاندۆلۆسیان گرتەبەر و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و پێنجی کۆچی ( ٩٥٦ زایینی )

## شۆڕشی ڕوزبەهان دژی مۆعیزئەلدەولە

لەم ساڵەدا ڕوزبەهان کوڕی وەندادی خەرشیدی دەیلەمی دژی مۆعیزئەلدەولە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە وبراکەی بەلکا لەشیراز شۆڕشی کرد. برای ئەم دوانە، ئەسفار، لەئەهواز ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ڕوزبەهان کەسەرقاڵی جەنگ لەگەڵ عیمران لەبوتەیحە بوو، ڕۆشتە واست و مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەهواز و پەیوەست بوون بەبراکەی کرد و لەرەجەب/ ئۆکتۆبەر گەیشتە ئەهواز. موهەلبی وەزیر لەوێ بوو. مەبەستی جەنگ لەگەڵ ڕوزبەهانی کرد بەڵام پیاوەکانی ئەو پەیوەستی ڕوزبەهان بوو و موهەلبی کشایەوە.

ئەم هەواڵە بەمۆعیزئەلدەولە گەیشت، بەڵام باوەڕی نەکرد چوونکە پێگەیەکی بەرزی بەڕوزبەهان بەخشیبوو لەکاتێکدا سەرەتا خۆی هیچ نەبوو بەڵام بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت. دەیلەمییەکان خوازیاری پەیوەست بوون بەڕوزبەهان بوون و ڕێگەی ناسازگاری دژی مۆعیزئەلدەولەیان گرتەبەر. ڕۆژانە دەستەیەك پەیوەستی ڕوزبەهان دەبوون. مۆعیزئەلدەولە لەپێنجی شەعبان/ سیانزە نۆڤەمبەر لەبەغداد ڕۆشت. خەلیفە موتیعیش شارەکەی بەجێهێشت تا پەیوەستی مۆعیزئەلدەولە بێت چوونکە کاتێك ئەم هەواڵە بەناسرئەلدەولە گەیشت، سوپاکەی خۆی لەموسڵەوە بەفەرماندەیی کوڕەکەی باوکی مەرجا بەرەو بەغداد ڕەوانە کرد تا بیخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە. کاتێك خەلیفە لەهێرشی ناسرئەلدەولە ئاگادار بوویەوە، بەناچاری بەغدادی بەجێهێشت. مۆعیزئەلدەولە، سەبوکتەکینی پەردەدار و دەستەیەکی دیکە لەبرواپێکراوانی بۆ بەغداد گەڕاندەوە. دەیلەمییەکانی بەغداد ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و کاتێك بەڵێنی وەرگرتنی ڕۆژانەیان پێدرا –هەرچەندە لەمۆعیزئەلدەولە بێ هیوا ببوون– ئارام بوونەوە.

مۆعیزئەلدەولە ڕۆیشت و گەیشتە پردی ئەربەق و لەوێ ئوردووی لێدا. ئەو کەسانێکی لەسەر ڕێگە دانا تا لەپەیوەست بوونی دەیلەمییەکان بەڕوزبەهان ڕێگری بکەن چوونکە ئەوان ڕۆژانەی خۆیان لەمۆعیزئەلدەولە وەردەگرت و دواتر بۆ پەیوەست بوون بەسوپاکەی ڕوزبەهان هەڵدەهاتن. مۆعیزەئەلدەولە، تورکەکان،

کۆیلەکانی خۆی و ژمارەیەکی کەم لەدەیلەمییەکانی بەبڕواپێکراو دەزانی.

لەکۆتاییەکانی رەمەزان/ هەژدەی ژانویە، مۆعیزئەلدەولە بڕیاریدا لەگەڵ هاوەڵە بڕواپێکراوەکانی خۆی بۆ جەنگی روزبەهان بڕوات. لەم کاتەدا دەیلەمییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و وتیان: ئەگەر ئێمە پیاوە شەرکەرەکانی تۆین، رێگە بدە شان بەشانی تۆ بجەنگین، چیتر ناتوانن لەگەڵ منالْ و کۆیلەکان ژیان بەسەر ببەین چوونکە ئەگەر تۆ سەرکەوتن بەدەست بێنیت ئەم سەرکەوتنە بەناوی ئێمە نابێت بەڵام ئەگەر دوژمنەکەت سەرکەوتن بەدەست بێنێت، سەرشۆڕییەکەی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە. ئەوان بۆ فریودانی مۆعیزئەلدەولە ئەم وتانەیان هێنایە سەرزمان تا خۆیان بەسوپاکەی روزبەهان بگەیێنن و بەسەر مۆعیزئەلدەولەدا زالْ ببن. مۆعیزئەلدەولە داوای لێکردن چاوەڕوان بن. وتی: دەمەوێت توانای جەنگی ئەوان هەڵسەنگێنم، بۆ بەیانی هەموان پێکەوە بۆ جەنگی ئەو بەرێدەکەوین. ئەو رۆژانەیەکی زیاتر بەدەیلەمییەکاندا و ئەوان دەستیان لەداواکەی خۆیان هەڵگرت.

مۆعیزئەلدەولە بەرێکەوت و سوپاکەی دەستە دەستە بۆ گۆڕەپانی جەنگ دەنارد. ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا تا هەتاو ئاوا بوو. تیری تورکەکان کۆتایی هات و شەکەت بوون. لەهیلاك بوونی خۆیان لای مۆعیزئەلدەولە سکالآیان بەرز کردەوە و وتیان: ئەمشەو وچان دەگرین و بەیانی دەگەڕێینەوە. مۆعیزئەلدەولە دەیزانی ئەگەر بگەڕێتەوە، روزبەهان و دەیلەمییەکان هێرشی دەکەنە سەر و هاوەڵە دەیلەمییەکانیشی پشتی ئەوان دەگرن و لەناوی دەبەن بەشێوەیەك کەتوانای هەلآتنیشی نەمێنێت. لەکاتێکدا فرمێسکی لەچاو دەباراند، داوای لێکردن هەموو دەستە جەنگییەکان کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی پێکەوە هێرش بەرەن و ئەو خۆی فەرماندەی سوپاکە بێت. بیری لەوە کردەوە یا سەرکەوتن بەدەست دێنێت یا دەکوژرێت. سەربازەکان داوای تیریان لێکرد. وتی: بڕێك تیر لای کۆیلەکان ماوەتەوە، وەریان بگرن و لەناو خۆتاندا دابەشی بکەن.

دەستەیەکی شیاو و چالاك لەکۆیلەکانی مۆعیزئەلدەولە کە جل و بەرگ و بەکەرەستەی جەنگ تەیار بوون، داوایان لەمۆعیزئەلدەولە کرد مۆڵەتی جەنگیان پێ بدات بەڵام مۆعیزئەلدەولە مۆڵەتی نەدا و وتی: لەکاتی پێویست ئێوە بۆ گۆڕەپان دەنێرم. مۆعیزئەلدەولە کەسی بۆ لای ئەوان نارد وفەرمانی پێدان تیرەکانی خۆیان

بەتورکەکان بدەن. لەدوورەوە بەدەست ئیشارەی کرد کەتیرەکان بدەن. ئەوان گومانیان کرد مۆڵەتی جەنگی پێداون و لەبەر ئەوەی حەساوە بوون، هێرشیان برد و ریزەکانی سوپای روزبەهانیان تێکشکاند و لەو لای سوپاکەی هاتنەدەر. ژمارەیەکی زۆریان لەسوپاکەی روزبەهان کوشت. مۆعیزئەلدەولەیش لەگەڵ هاوەڵانی هێرشی برد. روزبەهان و سوپاکەی شکستیان خوارد. روزبەهان و ژمارەیەك لەسەرکردەکان ئەسیر کران و زۆربەیان کوژران. مۆعیزئەلدەولە هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی نووسی بەڵام خەڵکان باوەڕیان نەکرد چوونکە لەهێز و توانای روزبەهان و ناتەوانی مۆعیزئەلدەولە ئاگادار بوون. مۆعیزئەلدەولە روزبەهانی لەگەڵ خۆی هێنایە بەغداد تا خەڵکان ببینن. ئەو سەبوکتەکینی بۆ جەنگی کوڕەکەی ناسرئەلدەولە رەوانەی عوکبرا کرد بەڵام سەبوکتەکین پێی نەگەیشتەوە چوونکە کاتێك کوڕی ناسرئەلدەولە لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، رێگەی موسڵی گرتەبەر. مۆعیزئەلدەولە روزبەهانی زیندانی کرد بەڵام ئاگادار بوویەوە کەدەیلەمییەکان دەیانەوێت بەزۆر لەزیندان بیهێننەدەر و بەیعەتی لەگەڵ ببەستن. لەبەر ئەمە شەوانە ئەوی لەزیندان بردەدەر و لەئاودا خنکاندی.

باوکی فەزڵ کوڕی عەمید کە لەگەڵ سوپاکەی بۆ جەنگی برای روزبەهان لەشیراز رەوانە کرابوو، رووبەرووی بوویەوە و سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا و فەرمانڕەوایی بۆ عێزەدئەلدەولە کوڕی رۆکن ئەلدەولە گەڕاندەوە.

بەم شێوەیە ناوی براکانی روزبەهان کەئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە، کۆتایی پێهات.

مۆعیزئەلدەولە دەستەیەك لەدەیلەمییەکانی گرت و چاوپۆشی لەدەستەیەك کرد. رێزی لەتورکەکان گرت و ئەوانی پێشخست و فەرمانیدا دەیلەمییەکان سەرکۆنە بکەن و دەستدرێژییان بکەنەسەر. دواتر جگە لەواست و بەسرە، داهاتێکی زیاتری خستە بەردەستی تورکەکان. ئەوان رۆشتن تا بەشانازی و غرورەوە داهاتەکانیان وەربگرن بەڵام هەموو شوێنێکیان وێران کرد و سامانەکانیان بەتاڵان برد. زیان و زەرەریان لەسوودیان زیاتر بوو.

## جەنگی سەیف ئەلدەولە لەسەرزەمینی رۆم

لەرەجەب/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ جەنگی رۆمییەکان بەرێکەوت. ئەو گەیشتە خەرشەنە و سارخە و چەند

قەڵایەکی گرت، ژمارەیەکی ئەسیر کرد و وێرانی نایەوە و ژمارەیەکی کوشت و بۆ ئەزەنە گەڕایەوە و لەو سەرزەمینە نیشتەجێ بوو تا فەرمانڕەوای تەرسوس هاتە لای و خەڵاتی پێبەخشی و چاکەی لەگەڵ کرد و ئەو بۆ حەلەب گەڕایەوە.

کاتێك ڕۆمییەکان لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە، هێزی خۆیان کۆکردەوە و هێرشیان کردە سەر مەیافارقین و شارەکەیان تالأن و وێران کرد. ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانەکەیان ئەسیر و سامانەکانیان کۆکردەوە و بردیان.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا لەنێوان دانیشتووانی ئیسفەهان و قوم لەبەر جیاوازی مەزهەب، ئاژاوە کەوتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: دەوترا پیاوێکی دانیشتووی قوم جوێنی بەیەکێك لەئەسحابەکاندا. ئەو لەهاوەڵانی شەحنەی ئیسفەهان بوو. دانیشتووانی ئیسفەهان شۆڕش و داوای هاوکارییان لەخەڵکانی دەوروبەر کرد و لەگەڵ خەڵکانێکی بێ ژمار هێرشیان کردە سەر ماڵی شەحنە. لەم شۆڕشەدا دەستەیەك کوژران و دانیشتووانی ئیسفەهان سامانی بازرگانەکانی خەڵکی قومیان تالأن کرد. ڕۆکن ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و توڕە بوو. کەسی بۆ ئیسفەهان نارد و باجی قورسی خستە سەر شانیان.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی عەبدولواحید کوڕی باوکی هاشم باوکی عەمرۆی خۆپارێز، کۆیلەی سەعلەب، لەمانگی زیقەعدە/ فەوریە کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا لەهەمەدان، ئەستەرئاباد و دەوروبەری، دوو ئەردهەژێنی گەورە ڕوویدا. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەژێر داروپەردوودا مردن. چەندین کەلێنیش لەدیوارەکانی قەسری شیرین دروست بوو.

لەجومادی الاخرە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە ڕۆمییەکان لەرێگەی دەریاوە بۆ جەنگی دانیشتووانی تەرسوس هاتن و هەزار و هەشتسەد کەس لەوانیان کوشت و ئاوەدانییەکانی دەوروبەریان سووتاند.

لەم ساڵەدا حەسەن کوڕی عەلی، فەرمانڕەوای سەقەلییە، لەگەڵ چەندین کەشتی جەنگی بەرەو ڕۆم بەرێکەوت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و شەشی کۆچی( ٩٥٧ زایینی )

### مەرگی مەرزوبان

لەرەمەزان/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، سەرکردە، مەرزوبانی ئازەربایەجان و ئەمیر ئەو سنورە مرد. کاتێك لەمەرگی خۆی دڵنیابوو، وەهسوزانی برای وەك جێگری خۆی دەستنیشان و دوای ئەو کوڕەکەی، جوستان کوڕی مەرزوبانی وەك ئەمیری ئازەربایەجان دیاریکرد.

مەرزوبان پێشتر فەرمانی بەنوێنەرەکانی خۆیدابوو دوای ئەو قەڵاکان تەنیا بەجوستانی کوڕی بدەن و ئەگەر جوستان مرد، بەکوڕەکەی تری ئیبراهیم و ئەگەر ئەویش مرد، بەکوڕەکەی دیکەی یانی ناسر. ئەگەر کەس لەوان نەمایەوە تەسلیمی وەهسوزانی برای بکەن. کاتێك مەرزوبان ئەم وەسیەتی بۆ براکەی کرد، نیشانەکانی نێوان خۆی و نوێنەرەکانی بۆ وەرگرتنی قەڵاکان فێر کرد. کاتێك مەرزوبان مرد، وەهسوزانی برای ئەنگوستیلە و نیشانەکانی براکەی بۆ سەرکردەی قەڵاکان نارد و خوازیاری وەرگرتنەوەی قەڵاکان بوو و ئەوان یەکەم وەسیەتی مەرزوبانیان ئاشکرا کرد. وەهسوزان گومانی کرد براکەی فریویداوە، لەبەر ئەمە ڕێگەی سازگاری لەگەڵ برازاکانی گرتەبەر بەڵام ئەوان لەبەرابەری وەستان و ڕێگەیان پێنەدا. وەهسوزان هاوشێوەی کەسێکی هەڵاتوو لەوان دوور کەوتەوە و لەئەردەبیلەوە ڕۆشتە تارەم. جوستان خۆڕاگری کردە پیشە و براکانی ملکەچی فەرمانەکانی بوون. باوکی عەبدوڵلەی نەعیمی وەزیر بوو. هەموو سەرکردەکانی باوکی جگە لەجوستان کوڕی شەرمزەن پەیوەستی بوون. ئەم سەرکردەیە هەوڵیدا بەسەر ئەرمەنستاندا زاڵ ببێت. ئەو خۆی فەرمانڕەوای ئەرمەنستان بوو.

وەهسوزان دووبەرەکی لەناو برازاکانی دەست پێکرد و هەوڵیدا ئەوان لەیەك دوور بخاتەوە و دوژمنانی بۆ گرتنی سەرزەمینەکەی ئەوان هاندا تا بەمەبەستەکەی خۆی بگات و ژمارەیەك لەوان بکوژێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەبەغداد و دەوروبەری ئاوسانی قوڕگ و ئاوسانی خوێنی (ماشرا) لەناو خەڵکان دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان بەهۆی ئەم دوو نەخۆشییە وجەڵتەوە دەمردن. هەرکەس کەڵەشاخی دەکرد، شلەمەنییەکی گەرم و زۆر، تا ئەنیشکی دەهاتەدەر و گرفتاری تایەکی کوشندە دەبوو. کەس بەسلامەت گیانی دەرباز نەدەکرد. لەو ساڵەیشدا باران نەباری.

لەم ساڵەدا مۆعیزئەلدەولە سوپای ڕازاندەوە و و بۆ پەچەکردار لەبەرابەر ناسرەئەلدەولە مەبەستی موسڵی کرد. ناسرئەلدەولە نامەیەکی بۆ نووسی و پارەی بۆ نارد و بەڵێنیدا لەسەرزەمینەکەی خۆی ساڵانە دوو هەزار درهەم باجی بۆ بنێرێت. بەم ئەندازەی بۆ نارد و مۆعیزئەلدەولە لەبەر وێرانی سنوورەکانی ژێر دەستی خۆی و لەبەر ئەوەی سەرکردەکانی بەکەسانی بڕواپێکراو نەدەزانی، گەڕایەوە. لەم کاتەدا ناسرئەلدەولە لەناردنی ئەو بڕەی بەڵێنیدابوو، پەشیمان بوویەوە و چەند و چۆنییەکەی ئاماژەی پێدەدرێت.

لەم ساڵەدا ئاوی دەریا هەشتا گەز کەمی کرد. چەندین دوورگە و کێو بینرا کەپێشتر بوونیان نەبوو. لەم ساڵەدا باوکی عەباس محەممەد کوڕی یەعقوب کوڕی یوسف کوڕی مەعقەلی ئومەوی نەیشابوری، ناسراو بەئەسەم کەوتەکانی لەحەدیس پێگەیەکی بەرزی هەیە، مرد. ڕەبیع کوڕی سلێمان، کەشوێنکەوتەی شافعی بوو و کتێبەکانی شاغعی لەو دەگێڕدرێتەوە، مرد.

لەم ساڵەدا باوکی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسحاق، فەقیهی بوخاری، مرد.

لەم ساڵەدا لەعێراق، چیاکان، قوم و کەنارەکانی ئەو سەرزەمینە چەندین ئەردهەژێن ڕوویدا و بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەردەوام بوو. هەندێ کات ئارامی دەگرت و هەندێ کات دەستی پێدەکردەوە. چەندین ماڵ وێران و ئاوەکان کەمی کرد و ژمارەیەکی زۆر لەژێر داروپەردوودا مردن.

لەڕەی و کەنارەکانی لەسەرەتای زیحەجە/ بیست و چواری فەوریە ئەردهەژێنێك ڕوویدا کەزۆربەی شوێنەکانی وێران و ژمارەیەکی بەرچاوی کوشت. لەتاڵەقان و کەنارەکانی چەندین ئەردهەژێن ڕوویدا و گیانی ژمارەیەکی زۆری گرت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و حەوتی کۆچی( ٩٥٨ زایینی )

### زاڵبوونی مۆعیززەلدەولە لەموسڵ و گەڕانەوەی لەو شارە

پێشتر وتمان مۆعیززەلدەولە بەوەرگرتنی دوو هەزار هەزار درهەم لەساڵ پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ناسرئەلدەولە بەست. کاتێك، کاتی ناردنی پارەکە هات، ناسرئەلدەولە لەناردنی خۆی دوادەخست و مۆعیززەلدەولە لەنیوەی جومادی الاوەل/ شەشی ئۆگۆست هێرشی کردە سەر موسڵ. موهەلبی وەزیر هاورێیەتی دەکرد. ناسرئەلدەولە موسڵی بەجێهێشت و بەرەو نەسیبین هەلات. مۆعیززەلدەولە دەستی بەسەر موسڵدا گرت.

شێوازی ناسرئەلدەولە بەم شێوە بوو هەرکات کەسێك مەبەستی هێرش کردنە سەر موسڵی دەکرد، ئەو شارەی بەجێدەهێشت و هەموو دەبیر و سەرپەرەستەکانی دیوان و ئەو کەسانەی شارەزای شوێنی پارەکانی حکومەت بوون، لەگەڵ خۆی دەبرد و لەقەلاکانی وەك کەواشی، زەعفەران و شوێنەکانی دیکە جێگەی دەکردنەوە. قەلای کەواشی لەو کاتەدا بەئەردوموشت ناودەبرا. ناسرئەلدەولە فەرمانی بەعەرەبەکان دەدا ئالیك و خواردەمەنی تالان بکەن و هەرکەس مەبەستی سەرزەمینەکەی ناسرئەلدەولەی دەکرد، ناکاوگیر دەکرا و ڕووبەرووی گرفتاری دەبوویەوە.

لەکاتی هێرشەکەی مۆعیززەلدەولە، ناسرئەلدەولە ئەو کارەی دووبارە کردەوە و مۆعیززەلدەولە و سوپاکەی گرفتاری کەمی ئالیك و خواردەمەنی بوونەوە. مۆعیززەلدەولە ئاگادار بوویەوە کەدانەوێڵەی حکومەتی لەنەسیبین فراوانە، بۆ ئەم مەبەستە لەموسڵەوە هێرشی کردە سەر ئەو شارە و سەبوکتەکینی پەردەداری وەك جێگری خۆی لەموسڵ دانا. کاتێك گەیشتە نیوەی ڕێگا، ئاگادار بوویەوە باوکی مەرجا و هیبە اللە، منداڵەکانی ناسرئەلدەولە، لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەسنجارن. سوپایەکی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد.

منداڵەکانی ناسرئەلدەولە کاتێك هاتنەخۆ کەسوپاکەی مۆعیززەلدەولە گەیشتبووە سەریان و چیتر نەیانتوانی باروبنەی خۆیان ببەن و هەرکەس توانی

سوار ئەسپەکەی بوو و هەڵات. سوپای مۆعێزئەلدەولە هاتە ناو خێوەتەکانیان و تالآنییان کرد. منالّەکانی ناسرئەلدەولە گەڕانەوە و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەر سوپاکەی مۆعێزئەلدەولە و شمشێریان دەرکێشا و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ژمارەیەکیان ئەسیر کرد و لەسنجار مانەوە.

مۆعێزئەلدەولە مەبەستی نەسیبینی کرد. ناسرئەلدەولە بۆ مەیافارقین هەڵات. هاوەڵانی ناسرئەلدەولە بەجێیان هێشت و بۆ لای مۆعێزئەلدەولە گەرانەوە و داوای ئەمانیان کرد. ناسرئەلدەولە کاتێك ئەمەی بینی، بەرەو حەلەب و بۆ لای براکەی هەڵات. کاتێك سەیف ئەلدەلە لەهاتنی براکەی ئاگادار بوویەوە، بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشت و ڕێزی گرت. خۆی بۆ خزمەت کردنی وەستا تا ئەو جێگەی بەدەستی خۆی پێڵاوەکانی لەپێ داکەند.

هاوەڵانی ناسرئەلدەولە لەقەڵاکانی موسڵ و جەزیرە ژیانیان بەسەر دەبرد و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر سوپاکەی مۆعیزئەلدەولە لەموسڵ، یا دەیانکوشتن یا ئەسیریان دەکردن و ڕێگەیان نەدەدا خواردەمەنییان پێ بگات.

لەم کاتەدا سەیف ئەلدەولە نامەی بۆ مۆعێزئەلدەولە نووسی و گفتوگۆی لەسەر ئاشتی کرد. نوێنەرەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد. مۆعێزئەلدەولە ڕازی نەبوو لەگەڵ ناسرئەلدەولە پەیمان ببەستێت چوونکە چەندین جار پەیمانەکەی شکاندبوو. سەیف ئەلدەولە بەڵێنیدا ساڵانە دووهەزار هەزار و نۆسەد هەزار درهەم باج بدات و سەربازە ئەسیرەکانی لەسنجار و شوێنەکانی دیکە ئازاد بکات. ئەم پێشهاتە لەمانگی موحەرەمی ٣٤٨/ مارسی ٩٥٩ زایینی ڕوویدا.

مۆعێزئەلدەولە لەگەڵ ئەوەی دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرتبوو، بەپێشنیارەکەی سەیف ئەلدەولە ڕازی بوو چوونکە گرفتاری نەداری و کەمی خواردەمەنی بوویەوە و خەڵکان لەدانی باج ناتەوان بوون ودەستیان بەبەرهەمەکانی خۆیان نەدەگەیشت و داوایان لەعەرەبەکان دەکرد هاوکاری سوپاکەی ناسرئەلدەولە بکەن. مۆعێزئەلدەولە ناچار بوو بگەڕێتەوە بەڵام لەگەڕانەوەی بێ ئەنجام ڕازی نەبوو و کاتێك نامەکەی سەیف ئەلدەولەی بەدەست گەیشت، ئاسوودە و بەپێشنیارەکەی ڕازی و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر.

## ڕەوانە کردنی سوپاکەی مۆعیزی عەلەوی بۆ کەنارەکانی مەغریب

لەم ساڵەدا پێگەی باوکی حەسەن جەوهەر لای مۆعیز لەئەفریقییە بەرز بوویەوە (هاوتای وەزارەت). مۆعیز ئەوی لەسەفەر/ ئاوریلی ئەم ساڵە لەگەڵ سوپایەکی گەورە کەزیری کوڕی مەنادی سەنهاجی وکەسانی دیکە لەناویدا دەبینران، بۆ کەنارەکانی مەغریب ڕەوانە کرد. ئەو تا تاهەرت پێشڕەوی کرد و لەوێ یەعلی کوڕی محەممەدی زەناتی هاتە لای. ئەو ڕێزی لەزەناتی گرت بەڵام دواتر ڕێگەی ناسازگاری لەگەڵ جەوهەری گرتەبەر و جەوهەر ئەوی گرت. هاوەڵانی زەناتی شۆڕشیان کرد و جەوهەر ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئەوان هەڵاتن. جەوهەر تا شاری ئەفکان شوێنیان کەوت و بەزۆری شمشێر ڕۆشتە ناو شارەکە و تاڵانکاری کردە پیشە و کۆشکەکانی یەعلی تاڵان کرد. مناڵەکەی ئەوی گرت کەهێشتا مناڵ بوو. فەرمانیدا ئەفکان وێران بکەن و بیسووتێنن. ئەم پێشهاتە لەمانگی جومادی الاخرە/ ئۆگۆست ڕوویدا.

جەوهەر بەرەو فاس بەڕێکەوت. فاس لەژێر فەرمانی ئەحمەد کوڕی بەکردا بوو، ئەحمەد دەروازەکانی شاری بەرووی ئەودا بەست. جەوهەر دابەزی و چەند ڕۆژێك جەنگی تاقی کردەوە بەڵام نەیتوانی شارەکە بگرێت. سەرکردە فاتمییەکان لەکەنارەکانی سوس دیاری و خەڵاتیان بۆ جەوهەر نارد و پێشنیاریان پێکرد هێرش بکاتە سەر سەجلماسە. سەجلماسە لەژێر فەرمانی محەممەد کوڕی واسول بەنازناوی شاکرللە بوو و بەسەروەری باوەڕداران ناویان دەبرد. ئەو سکەی بەناوی خۆی لێدابوو، لەو کاتەدا ساڵەکانی تەمەنی لەشانزە تێپەڕی نەدەکرد. کاتێك لەهاتنی جەوهەر ئاگادار بوویەوە، هەڵات و کاتێك ویستی بۆ سەجلماسە بگەڕێتەوە، دەستەیەك ئەویان بینی و گرتیان و بردیانە لای جەوهەر.

جەوهەر ڕۆشت تا گەیشتە بەحری محیط (ئۆقیانوسی ئەتڵەس). فەرمانیدا ماسی بۆ ڕاو بکەن. ماسییان بۆ گرت، ماسییەکەی خستە ناو ئاو و بۆ مۆعیزی نارد. ئەو ڕۆشتە کەنارەکانی ئەو سەرزەمینە و دەستی بەسەر هەموو ناوچەکاندا گرت و بۆ فاس گەڕایەوە و ماوەیەك بەجەنگەوە سەرقاڵ بوو. زیری کوڕی مەناد چەند کەسێکی بوێری هەڵبژارد وپەیژەکانیان هەڵگرت و مەبەستی شاری فاسیان

کرد. پەیژەکانیان بەدیوارە کورتەکەی شاردا هەڵواسی. خەڵکانی فاس ئاسوودە بوون. کاتێک گەیشتە سەر دیوارەکە، هەرکەسیان بینی، کوشتیان و خۆیان گەیاندە دیواری دووەم و دەروازەکانیان کردەوە و مەشخەڵەکانیان هەڵکرد و تەپڵەکانیان هێنایە دەنگ. فەرماندەی سوپاکە هەم زیری بوو هەم جەوهەر. کاتێک جەوهەر دەنگەکانی بیست، سوار ئەسپەکەی بوو و ڕۆشتە ناو فاس. فەرمانڕەوای فاس خۆی شاردەوە و دوو ڕۆژ دواتر قۆلبەستیان کرد و لای ئەمیری سەجلماسە زیندانی کرا. گرتنی فاس لەرەمەزانی ٣٤٨/ نۆڤەمبەری ٩٥٩ زایینی بوو. جەوهەر ئەم دوو زیندانییەی خستە ناو دوو قەفەس و ڕەوانەی دەرباری مۆعێزی لەمەهدییە کرد و تاهەرتی خستە ژێر فەرمانی زیری مەناد.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەسەرزەمینی چیاکان(لوڕستان و کوردستان) نەخۆشی کۆلێرا دەرکەوت و زۆربەی دانیشتووانی ئەو سەرزەمینە مردن. ژمارەی ژنان و منالآن لەناو مردووەکان زیاتر بوو. خەڵك چیتر نەیاندەتوانی سەردانی نەخۆشەکان بکەن یا لەگەڵ جەنازەکانیان بەرەو گۆڕستان بڕۆن چوونکە ژمارەی مردووەکان زیاد لەرادە فراوان بوو.

لەم ساڵەدا مانگ گیرا.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن عەلی کوڕی ئەحمەدی بوشەنجی سۆفی لەنەیشابور مرد. ئەو یەکێك لەسۆفییە ناودارەکان بوو. باوکی حەسەن محەممەد کوڕی حەسەن کوڕی عەبدوللە کوڕی باوکی شوارب، قازی بەغداد کە لەساڵی ٢٩٢/٩٠٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا، چاوی لەجیهان بەست. باوکی حسەین کوڕی عەلی کوڕی یەزید حافزی نەیشابوری لەجومادی الاوەل/ جولای کۆچی دوایی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی جەعفەر کوڕی دروستویە باوکی محەممەدی فارسی نەحوی لەمانگی سەفەر/ ئاوریل مرد. ئەو لەساڵی ٢٥٨/٨٧١ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەموبەرید زانستی نەحو فێر بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و هەشتی کۆچی ( ٩٥٩ زایینی )

لەموحرەمی ئەم ساڵە سەیف ئەلدەولە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ مۆعیزئەلدەولە بەست. مۆعیزئەلدەولە بۆ عێراق گەڕایەوە و ناسرئەلدەولە ڕێگەی موسڵی گرتەبەر.

لەم ساڵەدا خەلیفە، بۆ باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس، ئەمیری کرمان، خەلات و ئالای فەرمانڕەوایەتی نارد.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن محەممەد کوڕی ئەحمەدی مافروخی، دەبیری مۆعیزئەلدەولە مرد و ئەبوبەکر کوڕی باوکی سەعید دوای ئەو وەك دەبیر دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا لەنێوان عەلی کوڕی کامە، خوشکەزای ڕۆکن ئەلدەولە و بێستون کوڕی وەشمگیر جەنگ ڕوویدا. بێستون شکستی خوارد و هەڵات.

لەم ساڵەدا دە و چەند(سیانزە) لە بەلەمی حاجییەکانی موسڵ نغرۆ بوو.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر تەرسوس و ڕۆها وکوشتیان و ئەسیریان کرد و تاڵانکارییان کردە پیشە و بێ زیان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا مۆئەیید ئەلدەولە منالی ڕۆکن ئەلدەولە لەڕەی ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەگەڵ کچی مامەکەی، مۆعیزئەلدەولە، پەیوەندی هاوسەرگیری بەست و ئەوی لەگەڵ خۆی بردە ڕەی و دواتر بۆ ئیسفەهان گەڕایەوە.

لەجومادی الاوەل/ جولای ئەم ساڵە لەنێوان خەڵکی کۆڵان و گەڕەکەکانی بەغداد جەنگێکی قورس ڕوویدا و دەستەیەك لەناو خوێنی خۆیاندا گەوزان و زۆربەی بەشەکانی شار سووتا.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی سلێمان کوڕی حەسەن، فەقیهی حەنبەلی، ناسراو بەنەجار لەتەمەنی نەوەد و پێنج ساڵی مرد.

لەم ساڵەدا جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی نەسیری خولدی سۆفی کە لەهاوەڵانی جونەید حەدیسی دەگێڕایەوە، مرد.

لەم ساڵەدا باران نەباری و گرانی لەزۆربەی شارەکان دەرکەوت و خەڵکان لەکانونی دووەم/ ژانویە، نوێژەبارانەیان خوێند. یەکێك لەو شارانە بەغداد بوو بەڵام دوای نوێژە بارانەیش باران نەباری و لەئازار، مارس، هێرشی کوولەکان دەستی پێکرد و ئەوەی لەسەوزینەکان (دانەوێڵە) ڕەوا بوو، لەناوچوو. بارودۆخ بۆ خەڵکان دژوارتر بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و چل و نۆی کۆچی ( ٩٦٠ زایینی )

### دەرکەوتنی موستەجیر باللە

لەم ساڵەدا لەئازەربایەجان پیاوێك لەمناڵەکانی عیسا کوڕی موکتەفی باللە دەرکەوت بەنازناوی موستەجیر باللە. ئەو بۆ ڕەزامەندی بنەماڵەی محەممەد بەیعەتی وەردەگرت. خۆی وەك کەسێکی دادپەروەر و بۆ کارە شیاوەکان خەڵکی هاندەدا و ڕێگەی ئەنجامدانی کارە نەشیاوەکانی لێدەگرتن. شوێنکەوتەکانی فراوان بوون.

چۆنیەتی دەرکەوتنی ئەو بەم شێوەیە: جوستان کوڕی مەرزوبان، ئەمیری ئازەربایەجان، بۆ بەڕێوەبردنی سوپا، پێچەوانەی شێوازی باوکی گرتەبەر و سەرقاڵی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بوو و ڕاوێژی بەژنان دەکرد. جوستان کوڕی شەرمەزەن لەئەرمەنستان سەنگەری گرتبوو. وەهسوزان لەتارەم لەنێوان برازاکانی سازی ناسازگاری دەژەنی.

لەم کاتەدا جوستان کوڕی مەرزوبان، وەزیرەکەی خۆی، نەعیمی، گرت. ئەو لەگەڵ وەزیری جوستان کوڕی شەرمەزەن، باوکی حەسەن عوبەیداللە کوڕی محەممەد کوڕی حەمدویە، پەیوەندی خزمایەتی بوو. باوکی حەسەن لەگیرانی نەعیمی پەرێشان بوو. لەبەر ئەمە جوستان کوڕی شەرمەزەنی ناچار کرد بۆ ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان لەئەرمەنستان نامە بنووسێت و تەماحی فەرمانڕەوایەتی بخاتە بەردەم. کوڕی شەرمەزەن نامەی نووسی و ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان هات و هەموان پێکەوە مەبەستی مەراغەیان کرد و دەستیان بەسەردا گرت. کاتێك جوستان کوڕی مەرزوبان ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ کوڕی شەرمەزەن و وەزیرەکەی نووسی و ڕێگەی ئاشتی و سازانی لەگەڵ ئەو دووانە گرتەبەر و بەڵێنیدا نەعیمی ئازاد بکات. کوڕی شەرمەزەن لەهاوکاری کردنی ئیبراهیم خۆی بەدوور گرت و ئیبراهیم و براکەی هەستیان بەدوورویی شەرمەزەن کرد و نامەیان بۆ یەك نووسی و بۆجەنگ و لەناوبردنی کوڕی شەرمەزەن پەیمانیان بەست.

لەم کاتەدا نەعیمی لەزیندانی جوستان کوڕی مەرزوبان هەڵات و ڕۆشتە موقان و نامەی بۆ عیسا کوڕی موکتەفی نووسی و بۆ گرتنەدەستی خەلافەت هانیدا و بەڵێنیدا هێزی بۆ کۆبکاتەوە و ئازەربایەجان بخاتە ژێر فەرمانی ئەو. کاتێك کوڕی عیسا بەهێز

بوو، مەبەستی عێراقی کرد. سێسەد شاسوار هاورێیتیان دەکرد. جوستان کوڕی شەرمەزەنیش پەیوەستی بوو. ئەو بەهۆی پەیوەست بوونی جوستان بەهێز و خەڵکان دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد و پێگەی بەرز بوویەوە. جوستان و ئیبراهیم دوو کوڕەکەی مەرزوبان مەبەستی جەنگ و رووبەروو بوونەوەی ئەویان کرد. کاتێك دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە، هاوەڵانی موستەجیر هەڵاتن و خۆی ئەسیر کرا و لەناوچوو. دەڵێن ئەویان کوشت یا خۆی مرد.

## سەرکەوتنی وەهسوزان بەسەر برازاکانی و کوشتنی ئەوان

وەهسوزان کاتێك بینی برازاکانی رێگەی ناسازگاری یەکتریان گرتۆتەبەر و هەرکام فێڵ لەوەی دیکەیان دەکات، دوای جەنگی موستەجیر نامەی بۆ ئیبراهیم نووسی و خوازیاری بینینی ئەو بوو. ئیبراهیم چاوی پێیکەوت و رێزی لەمامی گرت و بەئەندازەیەك دیاری پێبەخشی کەلەژماردن نایەت. وەهسوزان نامەیەکی بۆ ناسر، برازاکەی تری، نووسی وهانیدا. ناسر لەجوستانی برای جیابوویەوە و رێگەی موقانی گرتەبەر. سوپاییەکان ئەویان بۆ کۆکردنەوەی سامان بەشیاو دەزانی. لەبەر ئەمە زۆربەیان لەجوستان جیابوونەوە و پەیوەستی ناسری برای بوون. بەم شێوەیە ناسر لەبراکەی بەهێزتر بوو و ئەردەبیلی خستە ژێر فەرمانی خۆی.

لەم کاتەدا سوپاییەکان داوای پارەیان لەناسر کرد و ئەو نەیتوانی ئەو برە پارە دابین بکات. وەهسوزای مامی ئامادە نەبوو هاوکاری بکات. ناسر زانی مامی فریویداوە و لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ جوستانی برای نووسی ورێگەی سازگارییان گرتەبەر و دەستیان خستە ناو دەستی یەك. ئەم پەیمانە کاتێك بوو ئەوان لەو پەڕی نەداری و پەرێشانیدا بوون و کارگوزارەکانیان دەستیان بەسەر سنور و سامانەکانی ژێر دەستیان گرتبوو. جوستان و ناسر، دوو منداڵەکەی مەرزوبان لەگەڵ دایکیان پەنایان بۆ وەهسوزان برد. نامەیەکیان بۆ نووسی و سوێندیاندا. وەهسوزان پەیمانی پێدان. ئەوان بۆ لای ئەو بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتنە لای، ئەو پەیمانەکەی خۆی شکاند و رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و ئەوانی قۆڵبەست کرد. جوستان و ناسر و دایکیانی زیندانی کرد و بەسەر ئوردووگاکەی ئەواندا زاڵبوو. ئیسماعیلی کوڕی وەك فەرمانڕەوا هەڵبژارد و زۆربەی قەڵاکانی بەو سپارد. سامانی خۆی خستە بەردەستی

سوپاییەکان و ڕەزامەندی ئەوانی بەدەست هێنا.

ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان هێرشی کردە سەر ئەرمەنستان و سوپاکەی بۆ جەنگی ئیسماعیل کۆکردبوویەوە تا دوو براکەی لەزیندانی مامەکەی ڕزگار بکات. وەهسوزان کاتێك لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، و بینی خەڵکان پشتیوانی لێدەکەن، پێشدەستی کرد و دایك و دوو کوڕەکەی کوشت و نامەی بۆ جوستان کوڕی شەرمزەن نووسی و داوای لێکرد ڕووبەڕووی ئیبراهیم ببێتەوە. وەهسوزان بەپارە و سەرباز هاوکاری کرد. جوستان ڕووبەڕووی ئیبراهیم بوویەوە و ئیبراهیم بەناچاری هەڵات و بۆ ئەرمەنستان گەڕایەوە. کوڕی شەرمەزەن بەسەر سوپاکەیدا زاڵ بوو و مەراغە و ورمێی خستە ژێر فەرمانی خۆی.

## جەنگی سەیف ئەلدەولە لەسەرزەمینی ڕۆم

لەم ساڵەدا سەیف ئەلدەولە لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر سەرزەمینی ڕۆم و لەوێ چەندین نیشانەی لەخۆی بەجێهێشت. گەڕەك و کۆڵانەکانی کردە خۆراکی ئاگر و دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت و تاڵانی و ئەسیری زۆری کۆکردەوە و گەیشتە خەرشەنە. لەم کاتەدا ڕۆمییەکان ڕێگەکانیان لێگرت و کاتێك مەبەستی گەڕانەوەی کرد، هاوڕێ تەرسوسیەکانی پێیان وت: ڕۆمییەکان ڕێگەکانیان بەستووە و چیتر توانای گەڕانەوەت نییە، باشترە لەگەڵ ئێمەدا بێیت. سەیف ئەلدەولە ڕازی نەبوو. ئەو کەپیاوێکی خۆپەسەند و خۆبین بوو، ڕاوێژ کردن لەگەڵ کەسانی دیکەی پەسەند نەدەکرد تا نەڵێن گوێڕایەڵی وتە و بۆچوونی کەسانی دیکەیە. ئەو لەوڕێگەی هاتبوو، گەڕایەوە. ڕۆمییەکان ڕووبەڕووی بوونەوە و ئەوەی وەك تاڵانی کۆی کردبوویەوە، لێیان سەندەوە و سامانەکانی خۆی و سوپاکەیان تاڵان کرد. شمشێریان خستە ناو سوپاکەی و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و ئەسیر کرد. سویف ئەلدەولە توانی لەگەڵ سێسەد سوار خۆی ڕزگار بکات. ئەم چارەنووسی ئەو کەسەیە گرنگی بەبۆچوونی زانا وبیرمەندەکان نادات و خواوەندی پەروەردگار بۆ کاروبارەکان بەتواناترە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەبدولمەلیك کوڕی نوح، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهر، یەکێك لەسوپاسالارەکانی خۆی بەناوی ئەجتەکینی گرت و کوشتی و بەم شێوەیە بارودۆخی خوراسان شڵەژا.

لەم ساڵەدا باوکی فەتح ناسراو بە کوڕی عوریان (ڕووت) عیمران کوڕی شاهین، ئەمیری بوتەیحە، لەگەڵ کەسان و سامانەکەی خۆی داوای ئەمانی لەمۆعیزئەلدەولە کرد چوونکە لەبراکەی دەترسا. مۆعیزئەلدەولە ئەمانی پێبەخشی و چاکەی لەگەڵ کرد.

لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەبدوللە کوڕی باوکی عەبدوللەی بورەیدی مرد.

لەم ساڵەدا نزیکەی دووسەد بنەماڵی تورك پێکەوە باوەڕیان بەئایینی ئیسلام هێنا.

لەم ساڵەدا حاجییەکانی میسر، حەجییان نەکرد و گەڕانەوە و لەدۆڵێك دابەزین و مانەوە. لەناکاو لافاوێك هات و هەمووی ئەوان و سامانەکانی لەگەڵ خۆی بەرەو دەریا برد.

لەم ساڵەدا ڕۆکن ئەلدەولە لەشاری ڕەی بەرەو جورجان بەرێکەوت و حەسەن کوڕی فیرزان و کوڕی عەبدرەزاق پێشوازییان لێکرد. ئەو سامانێکی زۆری بەو دووانە بەخشی.

لەم ساڵەدا لەشارەکان گرانی دەرکەوت. بەشی زۆری ئەم گرانییە لەموسڵ بوو کەنرخی یەك خەروار گەنم بۆ هەزار و دووسەد درهەم و بەهای یەك خەروار جۆ بۆ هەشتسەد درهەم بەرز بوویەوە. دانیشتووانی ئەم شارە بەناچاری بۆ عێراق و شام هەڵاتن. لەپێنجی شەعبان/ دووی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە لەنێوان خەڵکی گەڕەك و کۆڵانەکانی بەغداد شۆڕشێك هاتە ئاراوە و بەهۆیەوە نوێژی هەینی نەخوێندرا جگە لەمزگەوتی بەراسا کەخەڵکان نوێژی هەینییان خوێند چوونکە شۆڕش هەردوولای شارەکەی گرتبوویەوە. دەستەیەك لەمناڵەکانی هاشم لەبەر ئەوەی بەهۆکاری سەرهەڵدانی ئەم شۆڕشە دەناسران، قۆڵبەست و بەیانی ئەو ڕۆژە ئازاد کران.

لەم ساڵەدا یا نزیك لەم ساڵە، باوکی خەیسر ئەقتەعی تیناتی لەتەمەنی سەد و بیست ساڵیدا مرد.

لەم ساڵەدا باوکی ئیسحاق کوڕی سەوابە دەبیری خەلیفە و مۆعیزئەلدەولە مرد. دوای ئەو ئیبراهیم کوڕی هیلالی سابی کار سەرپەرەستی دیوانی نامەکانی گرتە ئەستۆ.

لەکۆتایی ئەم ساڵە/ دێسامبەر، ئەنەوجور کوڕی ئەخشید، فەرمانڕەوای میسر مرد و براکەی جێگەی گرتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پەنجای کۆچی( ٩٦١ زایینی )

## دروست کردنی کۆشکی مۆعیزئەلدەولە لەبەغداد

لەموحەرەم/ فەوریەی ئەم ساڵە مۆعیزئەلدەولە چیتر نەیتونی گمیز بکات و دوای ڕەنجی زۆر گمیزی خوێناوی و دواتر گمیز لەگەڵ وردە بەرد لەنێرینەی هاتەدەر. هاواری بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە. لەم کاتەدا موهەلبی وەزیر و سەبوکتەکینی پەردەداری بانگ کرد و پەیمانی ئاشتی پێ مۆر کردن و کوڕەکەی بەختیاری وەك جێگری خۆی دیاریکرد و سامانەکانی خستە بەردەست.

ماوەیەك دواتر باش بوویەوە و مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەهوازی کرد چوونکە گومانی دەکرد ئەو نەخۆشییانەی گرفتاریان دەبێت لەمانەوەی لەبەغداد سەرچاوەی گرتووە و دڵنیا بوو ئەگەر بۆ ئەهواز بگەڕێتەوە، نەخۆشییەکان، جەستەی بەجێدێڵن. گرنگی بەتوخمی گەنجی و پیری نەدەدا. کاتێك گەیشتە کەلوازی بۆ ئەوەی ڕێگەی ئەهواز بگرێتەبەر، هاوەڵانی داوایان لێکرد لەوێ بمێنێتەوە و ئەندێشە لەم شوێنگۆڕکێ بکات و پەلە نەکات. هیچ کام لەهاوەڵانی دوورکەوتنەوە لەنیشتمانی خۆیان پەسەند نەدەکرد و داخیان دەخوارد کەچۆن بەغداد بەگۆڕینی پایتەخت لەوێ، وێران دەبێت. داوایان لەمۆعیزئەلدەولە کرد بۆ بەغداد بگەڕێتەوە و لەسەرەوەی ئەم شارە کەهەوایەکی پاکتری هەیە، بناغەی کۆشکێك دابڕێژێت و لەوێ ژیان بەسەر ببات. ئەو ڕازی بوو و لەگەڕەکی ناسراو بەمەسناتی موعیزییە، دروست کردنی کۆشکەکەی دەست پێکرد. بڕی تێچوونی ئەم کۆشکە تا ئەو کاتەی مۆعیزئەلدەولە مرد، سیانزە هەزار درهەم بوو. ئەو بۆ دروست کردنی کۆشکەکەی ناچار بوو سامانی بەشێك لەهاوەڵانی زەوت بکات.

## مەرگی ئەمیر عەبدولمەلیك کوڕی نوح

لەم ساڵەدا ئەسپێك کەئەمیر عەبدولمەلیك کوڕی نوح، فەرمانڕەوای خوراسان سواری بوو، تلیدا و ئەمیر کەوتە خوار و مرد. بارودۆخی خوراسان دوای ئەو شڵەژا و مەنسور کوڕی نوحی برای جێگەی گرتەوە. مەرگی ئەو لەپێنجشەممەی یانزەی شەوال/ بیست و چواری نۆڤەمبەر روویدا.

## مەرگی عەبدولرەحمانی ناسر، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس و فەرمانڕەوایی کوڕەکەی حاکم

لەرەمەزان/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوللە، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، بەنازناوی ناسرئەلدین باللە مرد. ئەو پەنجا ساڵ وشەش مانگ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت و ساڵەکانی تەمەنی لەحەفتا و سێ کۆتایی پێهات. روخساری سپی، چاوەکانی شەهلا و پیاوێکی قۆز بوو، ئەندامی ئەستور، قاچی کورت و پشتی بڵند و درێژ بوو. لەناو ئومەوییەکان یەکەم کەس بوو نازناوی خەلیفەی لەخۆی نا و بەسەروەری باوەڕداران ناویان برد. یانزە کوڕی هێنایە دنیا. باوەگەورێکانی ئەویان بەئەمیر زادە یا خەلیفە زادە ناو دەبرد و بەم ناوە وتاریان بەناو دەخوێندنەوە. تا بیست و حەوت ساڵ لەفەرمانڕەوایەتییەکەی ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا و لەم کاتەدا کاتێك لاوازی خەلیفەکانی عێراق و دەرکەوتنی عەلەوییەکانی ئەفریقییەی بینی و بیستی ئەوان خۆیان بەسەروەری باوەڕداران ناو دەبەن، فەرمانیدا نازناوی ناسرئەلدینی پێ ببەخشن و بەسەروەری باوەڕداران ناوی بێنن. خەڵکانی ئاندۆلۆس دەیانوت: ئەو یەکەم خەلیفە بوو دوای باوەگەورێکانی خۆی هاتە سەرکار. دایکی ئەو، دایکی منداڵ بوو بەناوی موزنە. کەس لەو کەسانەی نازناوی سەروەری باوەڕدارانیان پێبڕا جگە لەموستەنسیری عەلەوی فەرمانڕەوای میسر کەشەست ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد، بەئەندازەی ئەو فەرمانڕەوایەتی نەکرد.

دوای مەرگی، کوڕەکەی حاکم کوڕی عەبدولرەحمان، بەنازناوی مونتەسیر لەسەر

تەختی باوکی دانیشت. دایکی ئەویش دایکی منالْ بوو بەناوی مەرجانە. عەبدولرەحمانی ناسر چەندین منالْی هێنایە دنیا کەیەك لەوان عەبدوللە بوو. عەبدوللە شوێنکەوتەی ئاینی شافعی و زانای ئەدەب و مێژوو و پیاوێکی لەخواترس و خۆپارێز بوو.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم سالْەدا سوپایەکی گەورە لەئەنتاکییەوە بەرەو تەرسوس بەرێکەوت و ئەمیری ئەنتاکیە هاورێیەتی دەکردن. سەربازەکانی رۆمی دەرکەوتن و هەموو موسولْمانانیان ئەسیر کرد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. ئەمیری ئەنتاکیە بەبرینداری هەلاْت.

لەرەمەزان/ ئۆکۆتبەری ئەم سالْە نەجا، کۆیلەی سەیف ئەلدەولە، لەکەنارەکانی مەیافارقینەوە رۆشتە ناو سەرزەمینی رۆم و لەو رەمەزانەدا هەموو کەل و پەلە گرانباییەکانی تالاْن کرد و ئەوی بینی، ئەسیری کرد و بێ زیان گەڕایەوە.

لەم سالْەدا قازی باوکی سائیب عوتەبە کوڕی عەبدوللە مرد و زەوییەکانی دەستی بەسەردا گیرا و باوکی عەباس کوڕی عەبدولله کوڕی حەسەن کوڕی باوکی شوارب، وەك قازی قازییەکان دەستنیشان کرا و بەلْێنیدا سالاْنە دووسەد هەزار درهەم بەمۆعێزئەلدەوله بدات. ئەو یەکەم قازی بوو کاروباری دادپەروەری کڕییەوە و لەرۆژگاری مۆعێزئەلدەوله ئەم کڕین و فرۆشە ئەنجامدرا. پێشتر کاری لەو شێوە نەکرابوو. خەلیفە موتیع چیتر رێگەی پێنەدا بڕواتە بارەگاکەی و لەبەر ئەو کارەی، لەهاونشینی خۆی دووری خستەوە. لەمە دوا کاروباری ژمێریاری و پاسەوانیش لەبەغداد مامڵەی پێوە دەکرا.

لەم سالْەدا باوکی قاسم برای عیمران کوڕی شاهین هاتە لای مۆعێزئەلدەولە تا ئەمانەکەی وەربگرێت.

لەم سالْەدا قازی ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی کامیل، لەهاوەلاْنی تەبەری، کەمێژووی ئەوی دەگێڕایەوە، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سەد و پە نجا و یەکی کۆچی ( ٩٦٢ زایینی )

### زاڵبوونی ڕۆمییەکان لەعەین زەربە

لەموحەرەم/ فەوریەی ئەم ساڵە ڕۆمییەکان بەفەرماندەیی دوموستوق لەعەین زەربە دابەزین. عەین زەربە داوێنی چیایەکی گەورە بوو. شارەکە لەسەرەوە جێگیر بوو. ژمارەی سوپای ڕۆمییەکان لەژماردن نەدەهات. دوموستوق دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ بەرزایی چیاکە ڕەوانە کرد و ئەوان دەستیان بەسەردا گرت. کاتێك دانیشتووانی ئەم شارە دوموستوقیان بینی کەبارودۆخی لێ دژوار کردوون و عارەبانە جەنگییەکانی پێیە کەدەتوانێت دیواری شارەکە وێران بکات و لەگەڵ ئەوەیشدا سەرقاڵی لێدانی تونێڵە بۆ ناو شارەکە، بەناچاری داوای ئەمانیان کرد. دوموستوق ئەمانی پێبەخشین و ئەوان دەروازەی شارەکەیان بۆ کردەوە. کاتێك دوموستوق ڕۆشتە ناو شارەکە و بینی هاوەڵانی پێشتر ڕۆشتوونەتە ناو شارەکە، لەبەخشینی ئەمان بەخەڵکان پەشیمان بوویەوە.

ئەو لەسەرەتای شەو لەشاردا جاڕیدا هەموو دانیشتووانی شارەکە لەمزگەوتی گەورە کۆببنەوە و هەرکەس لەماڵەکەی بمێنێتەوە، دەکوژرێت. هەرکەس توانی لەماڵەکەی هاتەدەر و لەبەرەبەیاندا دوموستوق سوپاکەی لەناو شارەکەدا بڵاو کردەوە کەژمارەیان شەست هەزار کەس بوو. فەرمانی پێدان هەرکەس لەناو ماڵەکاندا ببینن، خوێنی بڕێژن. پیادەکان ژمارەیەکی زۆر لەژن و منداڵ و پیاوەکانیان کوشت. دوموستوق فەرمانی پێدان کەرەستەکانی جەنگ کۆبکەنەوە. کەرەستەی فراوانی جەنگ کۆکرایەوە.

دواتر فەرمانی بەخەڵکانی ناو مزگەوتەکەدا هەمان ڕۆژ بۆ کوێ دەخوازن بڕۆن و ئەگەر شەو بیانبینێت، دەیانکوژێت. خەڵك بەقەرەباڵغییەکی زۆر بەرێکەوتن و ژمارەیەك لەژێر دەستی و پێی یەکتر گیانیاندا. پاشماوەکان بێ ئەوەی بزانن بەرەو کوێ دەڕۆن، سەرگەردان شارەکەیان بەجێهێشت. ژمارەیەکیان لەرێگەدا مردن و ڕۆمییەکان لەکۆتایی ڕۆژ هەرکەسێکیان لەناو شارەکە بینی، کوشتیان و سامانی

خەڵکانیان تالان و هەردوو دیواری شارەکەیان وێران کرد.

دوموستوق بیست و یەك رۆژ لەسەرزەمینی ئیسلام مایەوە و بەزۆری شمشێر یا بەبەخشینی ئەمان دەستی بەسەر پەنجا و چوار قەلای موسولمانان گرت. لەیەکێك لەو قەلایانەی بەئەمان دەستی بەسەردا گیرابوو، فەرمانی رۆشتنەدەر بەخەڵکان درا. پیاوێکی ئەرمەنی داوێنی ژنێکی موسولمانی گرت. ئەمە بووە هۆی ئەوەی غیرەتی پیاوی موسولمان بجوولێت و دەستی بۆ شمشێر برد. ئەمە تورەیی دوموستوقی لێکەوتەوە و فەرمانی کوشتنی هەموو موسولمانانی دەرکرد کەژمارەیان چوارسەد کەس بوو. ژنان و منالەکانیشیان کوشت و کەسیان بەزیندووی نەهێشتەوە مەگەر ئەوەی شیاوی کۆیلایەتی بوو.

لەمانگی رەمەزانی مەسیحییەکان، ئەو رۆشت تا دوای جەژن بگەرێتەوە و سوپاکەی خۆی لەقیسارییە بەجێهێشت. لەم کاتەدا کوری زیات، ئەمیری تەرسوس، لەگەڵ چوار هەزار جەنگاوەری تەرسوسی هێرشی کردە سەر دوموستوق بەلام دوموستوق سوپاکەی سەرکوت کرد و زۆربەی سەربازەکانی کوشت. ئەو براکەی کوری زیاتی کوشت. کوری زیات کەئالای شۆرشی هەلکردبوو و چیتر بەناوی سەیف ئەلدەولە کوری حەمدان وتاری نەدەخوێندەوە، بۆ تەرسوس گەرایەوە. ئەم شکستە بووە هۆی ئەوەی خەلکانی ئەو شارە خوازیاری فەرمانرەوایەتی سەیف ئەلدەولە کوری حەمدان بن و بەناوی ئەو وتار بخوێننەوە و لەمبارەوە نامەیان بۆنووسی. کوری زیات کاتێك لەمە ئاگادار بوویەوە، رۆشتە مالەکەی خۆی لەرەوشەن فەراز و خۆی لەناو ئاودا خنکاند. دانیشتووانی بوغراس نامەیان بۆ دوموستوق نووسی و سەد هەزار درهەمیان بۆ نارد. دوموستوق لەجەنگ دژی ئەوان چاوپۆشی کرد.

## زالبوونی رۆمییەکان لەشاری حەلەب و گەرانەوەی ئەوان لەو شارە

لەم سالەدا رۆمییەکان دەستیان بەسەر شاری حەلەبدا گرت بەلام نەیانتوانی دەست بەسەر قەلای شارەکەدا بگرن.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: دوموستوق بێ ئەوەی موسولمانان ئاگادار

بینەوە، بەرەو حەلەب بەرێکەوت. موسولمانان چاوەروانی هاتنی ئەو نەبوون چوونکە ئەو سوپاکەی لەقیسارییە بەجێهێشتبوو. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا هاتە ناو سەرزەمینی موسولمانان و کاتێك مانگی رۆژووی مەسیحییەکان کۆتایی پێهات، بێ ئەوەی کەس ئاگادار ببێتەوە، هێرشی کردە سەر حەلەب. کاتێك موسولمانەکان لەهاتنی ئەو ئاگادار بوونەوە کەخۆی گەیاندبووە حەلەب. حەلەبی سەرکوت کرد. نەسەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان و نەکەسی دیکە لەهێرشەکەی ئاگادار نەبوویەوە.

کاتێك دوموستوق گەیشتە حەلەب و سەیف ئەلدەولە لەم هێرشە ئاگادار بوویەوە، بەخێرایی سوپای کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر دوموستوق. جەنگ لەنێوان دوو سوپا روویدا بەلام سەیف ئەلدەولە لەبەر کەمی ژمارەی سوپاکەی نەیتوانی خۆڕاگری بکات و ژمارەیەکی زۆری سوپاکەی کوژران و لەمنالەکانی داود کوڕی حەمدان کەس نەمایەوە. هاوەلانی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان هەمووی کوژران و سەیف ئەلدەولە لەگەل ژمارەیەکی کەم رێگەی هەلاتنی گرتەبەر. دوموستوق دەستی بەسەر کۆشکەکەیدا گرت. کۆشکی سەیف ئەلدەولە لەدەرەوەی شاری حەلەب و لەشوێنێك بەناوی دارین بوو. ئەو لەکۆشکی سەیف ئەلدەولە سێسەد هەزار درهەمی دەستکەوت و هەزار و چوارسەد ئێستری لەکۆشکەکەی برد. بەئەندازەیەك کەرەستەی جەنگی تالان کرد کە لەژماردان نایەت. دواتر کۆشکەکەی وێران کرد و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و دانیشتووانی حەلەب رووبەرووی بوونەوە.

رۆمییەکان کەلێنیان لەدیواری شارەکە دروست کرد. خەلکی حەلەب بۆ وەرگرتنەوەی ئەم کەلێنانە بەرگرییان دەکرد و پاشەکشێیان پێکردن. کاتێك شەو داهات، کەلێنەکانیان پڕ کردەوە و کاتێك رۆمییەکان ئەمەیان بینی، بۆ کێوی جوش پاشەکشێیان کرد.

لەم کاتەدا ئێشکگرانی شەوانەی شار، مەبەستی تالان کردنی مال و کاروان سەرای بازرگانەکانیان کرد. خەلك خۆیان گەیاندە سامانەکان تا رێگە لەتالان کردنیان بگرن و بەم شێوەیە کەس نەمایەوە بەرگری لەدیواری شارەکە بکات و

کاتێك رۆمییەکان ئەمەیان بینی، دەرفەتیان قۆستەوە و خۆیان لەدیوارەکە نزیك کردەوە. کەس رێگری لێ نەکردن و ئەوان خۆیان گەیاندە دیوارەکە. بینیان ئاژاوە لەناو دانیشتووانی شارەکە سەری هەڵداوە. هاتنە خوار و دەروازەکانیان کردەوە و شمشێر بەدەست رۆشتنە ناو شارەکە و ئەوەی بینیان، کوشتیان. شمشێرەکانیان نەکردە کێلان مەگەر ئەو کاتەی لەجەنگ و کوشتن شەکەت و ماندوو و هێز و توانای خۆیان لەدەستدا.

لەحەلەب هەزار وچوارسەد کەس لەهاوەڵانی دوموستوق زیندانی بوون و بەم شێوەیە لەزیندان رزگاریان بوو. ئەوان شمشێریان بەدەستەوە گرت و سەرقاڵی کوشتاری خەڵکان بوون. نزیکەی سیانزەهەزار کچ و کوڕی منداڵیان گرت. تالانییەکی فراوانیان کۆکردەوە کەخەملاندنی ئەگەری نییە. کاتێك رۆمییەکان نەیاندەتوانی پاشماوەی کالاکان لەگەڵ خۆیان ببەن، دوموستوق فەرمانیدا بیانسووتێنن. مزگەوتەکانیشی سووتاند. ئەو رازی ببوو بەوەرگرتنی سێ هەزار منالی کچ و کوڕ و بڕێك سامانی دیاریکراو ئەمانیان پێ بدات و دەست لەکوشتاری خەڵکان هەڵبگرێت بەلام کاتێك خەڵکان بەپێشنیارەکەی رازی نەبوون، ئەو بەلایان بەسەر هات کەئامارژەمان پێدا. ژمارەی سوپاکەی نزیکەی دووسەد هەزار سەرباز بوو. سی هەزار کەسیان زرێیان پۆشیبوو، سی هەزار کەسیان پاچ بەدەست بوون کەوێرانیان دەکرد و رێگەیان لەبەفر پاك دەکردەوە و چوار هەزار ئێسر دڕکی ئاسنییان هەڵگرتبوو.

کاتێك سوپای رۆم هێرشی کردە سەر شارەکە، هەرکەس توانی بەبەدبەختی خۆی گەیاندە قەلای شارەکە. دوموستوق نۆ رۆژ لەو شارە مایەوە. ویستی لەگەڵ تالانییە فراوانەکان شارەکە بەجێبێڵێت کەخوشکەزاکەی پێی وت: ئەم شارە لەدەستی ئێمەدایە و کەس ناتوانێت لێرە دەرمانپەرێنێت، بۆ دەبێت چاوپۆشی لێ بکەین؟ دوموستوق وتی: ئێمە ئەوەمان دەستکەوت هیچ فەرمانڕەوایەك بەتەمای نەبوو، تالانیمان دەستکەوت، کوشتمان، وێرانمان کرد، سووتاندمان و ئەسیرەکانی خۆمان ئازاد کرد و بەئەندازەیەك سامانمان دەستکەوتووە سنووری بۆ نییە. ئەوان گفتوگۆیان دەکرد تا ئەوەی دوموستوق پێی وت: هێرش بکە سەر

قەڵاکە و گەمارۆی بخەسەر. من و سوپاکەم لای دەروازەی شارەکە دەمێنینەوە. خوشکەزاکەی شمشێر و قەڵغان بەدەست بەرەو قەڵاکە بەرێکەوت. رۆمییەکان شوێنی کەوتن. کاتێك لەقەڵاکە نزیك کەوتەوە، بەردێکیان بۆ خستەخوار و بەری کەوت. دارێکیان لێدا و مرد. هاوەڵانی ئەویان هەڵگرت و بۆ لای دوموستوق گەڕانەوە. کاتێك دوموستوق جەنازەی خوشکەزاکەی بینی، ئەسیرە موسوڵمانەکانی کوشت. ژمارەی ئەسیرەکان هەزار و دووسەد کەس بوو. ئەو بێ ئەوەی هێرش بکاتە سەر کەنارەکانی حەلەب، بۆ سەرزەمینەکەی خۆی گەڕایەوە. فەرمانی بەدانیشتووانی شارەکەدا سەرقاڵی وەرزێری و کشتوکاڵ بن بۆ ئەوەی بەگومانی خۆی جارێکی دیکە هێرشیان بکاتەسەر.

## زاڵبوونی رۆکن ئەلدەولە کوڕی بویە لەتەبەرستان و جورجان

لەموحەرەم/ فەورییەی ئەم ساڵە رۆکن ئەلدەولە هێرشی کردە سەر تەبەرستان. تەبەرستان لەژێر فەرمانی وەشمگیردا بوو. وەشمگیر هەڵات و مەبەستی جورجانی کرد. رۆکن ئەلدەولە تا ئەوەی هەموو کەنارەکانی تەبەرستانی خستە ژێر فەرمانی خۆی، لەو شارە مایەوە و دوای ئەوەی کاروبارەکانی ئەو سەرزەمینەی رێکخست، بەرەو جورجان بەرێکەوت. وەشمگیر ئەو شارەیشی بەجێهێشت و رۆکن ئەلدەولە دەستی بەسەردا گرت. سێ هەزار سەربازی وەشمگیر داوای ئەمانیان لەرۆکن ئەلدەولە کرد و بەم شێوەیە ژمارەی سوپاکەی زیادی کرد و ناتەوانی وەشمگیر دوو بەرابەر بوو و بەناچاری بەرەو چیاکان هەڵات.

## دروشمی نووسرا لەسەر دیواری مزگەوتەکانی بەغداد

لەرەبیع الاخر/ مەی ئەم ساڵە شیعەکانی بەغداد بەفەرمانی مۆعێز ئەلدەولە لەسەر دیواری مزگەوتەکانی شار نووسیان: نفرینی خواوەند لەمعاویە کوڕی ئەبی سوفیان و لەو کەسەی فەدەکی فاتیمەی پێشێل کرد و لەو کەسەی رێگەی لەبەخاك سپاردنی حەسەن لای ئارامگای باوەگەورێی گرت وئەو کەسەی ئەبوزەری

لەشارەکەی دوور کردەوە و ئەو کەسەی عەباسی لەشورا دەرکرد. خەلیفەیش نەیدەتوانی رێگەی لەنووسینی ئەم دروشمانە بگرێت. مۆعیز ئەلدەولەیش خۆی فەرمانی ئەو کارەی دابوو.

کاتێك شەو داهات، دەستەیەك لەخەڵکان ئەم دروشمانەیان پاك کردەوە و مۆعیز ئەلدەولە بڕیاریدا دووبارە بیاننووسێتەوە بەڵام باوکی محەممەدی موهەلبی وەزیر پێشنیاری پێکرد لەجیاتی ئەو دروشمانە بنووسێت: نفرینی خواوەند لەو کەسانەی ستەمیان لەبنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) کرد ولەم نفرینەدا تەنیا ئاماژە بەناوی معاویە بدرێت. مۆعیز ئەلدەولە ئەو کارەی کرد.

## گرتنی تەبەرمینی سەقەلییە

لەم ساڵەدا سوپای موسوڵمانان بەرەو سەقەلییە بەرێکەوت. سەقەلییە لەو کاتەدا لەژێر فەرمانی ئەحمەد کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی باوکی حسەین بوو. موسوڵمانان تا قەڵای تەبەرمینی سەقەلییە پێشڕەوییان کرد کە لەدەستی رۆمییەکاندا بوو و گەمارۆیان خستەسەر. ئەم قەڵایە یەکێك لەبەهێزترین و تۆکمەترینی ئەو قەڵایانە بوو کەگرتنی بۆ موسوڵمانان دژوار دەهاتە بەرچاو. دانیشتووانی ئەو شارە خۆڕاگرییان کرد و گەمارۆکەی سەریان درێژەی کێشا. موسوڵمانان کاتێك خۆڕاگری ئەوانیان بینی، ئاوی شارەکەیان بڕی و ڕێڕەوێکی تازەیان بۆ دروست کرد. دانیشتووان بەرگەی نەبوونی ئاویان نەگرت و پێشنیاری ئەمانیان بەرز کردەوە بەڵام وەڵامیان نەدرایەوە و موسوڵمانان سەرئەنجام رازی بوون نەیانکوژن بەو مەرجەی بەندە و کۆیلەی موسوڵمانان بن و سامانەکانیان تەسلیم بەموسوڵمانان بکەن. دانیشتووانی قەڵاکە بەم مەرجە رازی بوون و هاتنەدەر و موسوڵمانان لەزیقەعدە/ دێسامبەر ئەو قەڵایان خستە ژێر فەرمانی خۆیان.

ئەم گەمارۆیە حەوت مانگ و نیو درێژەی کێشا و دەستەیەك لەموسوڵمانان لەقەڵاکە نیشتەجێ کران. ئەم قەڵایە دواتر لەبەر پەیوەندی بەمۆعیزی عەلەوی، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، بەمۆعیزییە ناوی دەبرا.

سوپایەك بەفەرماندەیی حەسەن کوڕی عەمار بەرەو ڕەمتە بەڕێکەوت و گەمارۆی خستەسەر و بارودۆخی لەدانیشتووانەکەی دژوار کرد و ئەوەی لێکەوتەوە کە لەگێرانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٣٥٣/٩٦٤ زایینی ئاماژەی پێدەدەین.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە ئەمیر مەنسور کوڕی نوح، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهر یەکێك لەسەرکردەکانی خۆی بەناوی ئەلفتەکین بۆ بارەگاکەی بانگ کرد بەڵام ئەو سەرکردەیە نەڕۆشت. مەنسور سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو نارد و سەرکردەکە، شکستی بەسوپاکەی ئەمیر مەنسور هێنا و سوپاسالارەکانی گرت کەیەکیان خاڵی مەنسور بوو.

لەنیوەی رەبیع الاوەل/ بیست و چواری ئاوریلی ئەم ساڵە مانگ بەتەواوی گیرا.

لەجومادی الاوەل/ جونی ئەم ساڵە لەشارەکانی بەسرە و هەمەدان لەنێوان دانیشتووانەکەی لەسەر کێشەی مەزهەبی جنگ ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر کوژران.

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان قەڵای دەلوك و سێ قەڵای دەوروبەری ئەو قەڵایان بەزۆری شمشێر گرت.

لەم ساڵەدا خەلیفە موتیع، نازناوی عێزەد ئەلدەولەی بەفەنا خوسرەو کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە بەخشی.

لەجومادی الاخرە/ جولای ئەم ساڵە سەیف ئەلدەولە عەین زەربەی نۆژەن کردەوە و پەردەدارەکەی خۆی لەگەڵ سوپایەك لەتەرسوسییەکان بۆ سەرزەمینی ڕۆم ڕەوانە کرد. ئەوانیش تاڵانییان کۆکردەوە، کوشتیان و سووتاندیان و ئەسیریان کرد وگەڕانەوە. ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر قەڵای سیسییە و دەستیان بەسەردا گرت.

لەم ساڵەدا نەجا، کۆیلەی سەیف ئەلدەولە لەگەڵ سوپایەك بەرەو قەڵای زیاد بەڕێکەوت. دەستەیەك لەڕۆمییەکان ڕووبەڕووی بوونەوە و ئەو شکستی پێهێنان و پێنسەد کەس لەڕۆمییەکان داوای ئەمانیان کرد.

لەشەوال/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ڕۆمییەکان باوکی فوراس کوڕی سەعید کوڕی

حەمدانیان لەمەنبەج ئەسیر کرد. ئەو فەرمانڕەوایەتی مەنبەجی لەژێر دەستابوو. دیوانێکی جوانی لەهۆنراوەکانی خۆی کۆکردۆتەوە.

لەم ساڵەدا سوپایەك لەرۆمییەکان لەرێگەی دەریاوە هێرشیان کردە سەر دوورگەی ئەقریتش(کریت).

دانیشتووانی ئەم شارە پەیکیان بۆ لای مۆعیزئەلدین الله، فەرمانڕەوای ئەفریقییە نارد و داوای هاوکارییان کرد و ئەو هاوکاری کردن. ئەوان ڕووبەڕووی ڕۆمییەکان بوونەوە و سەرئەنجام سەرکەوتن بەموسوڵمانەکان بڕا و ڕۆمییەکانی ئەم دوورگەیان ئەسیر کرد.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی حەسەن کوڕی زیادی نەقاشی موقری، نووسەری کتێبی شفاالصدور و عەبدولباقی کوڕی قانع، موالی مناڵەکانی ئومەییە، کە لەساڵی ٩٠٧/٢٩٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو، مردن. دەعلەج کوڕی ئەحمەدی سەجزی عەدل و باوکی عەبدولله محەممەد کوڕی باوکی موسای هاشمیش لەم ساڵەدا مردن.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پەنجا و دووی کۆچی (٩٦٣ زایینی)

### شۆڕشی خەڵکی حەڕان

لەسەفەر/ مارسی ئەم ساڵە خەڵکی حەران دژی فەرمانڕەواکەی خۆیان، هیبە الله کوڕی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ئەو بەنوێنەرایەتی مامی فەرمانڕەوایەتی حەڕان و بەشەکانی موزێری دەکرد. نوێنەرەکانی ئەو ستەمیان لەخەڵکان دەکرد و زۆرداریيان کردە پیشە و کاڵا زەوت کراوەکانی خەڵکی حەرانییان بەبازرگانەکانی ئەم شارە دەفرۆشت.

هیبە الله لای مامی لەحەلەب بوو کەخەڵکان دژی کارگوزارەکانی ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ئەوانیان دەرپەڕاند. هیبە الله لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و هێرشی کردە سەریان و ڕووبەڕوویان بوویەوە و ئاکاوگیری کردن. هەردوو سوپا زیاتر لەدوو مانگ بەجەنگەوە سەرقاڵ بوون و ژمارەیەکی زۆر کوژران. سەیف ئەلدەولە کاتێك هەستی بەگەورەیی ڕووداوەکە و مەترسییەکانی کرد، هاتە لای حەرانییەکان و نامەی بۆ نووسین و بەخواست و داواکانیان ڕازی بوو. ئەوانیش ڕێگەی سازگارییان گرتەبەر و دەروازەکانی شارەکەیان کردەوە بەڵام کەسانێکی زۆر لەترسی هیبە الله هەڵاتن و شارەکەیان بەجێهێشت.

### مەرگی باوکی محەممەدی موهەلبی (وەزیر)

لەجومادی الاخرە/ جونی ئەم ساڵە باوکی محەممەدی موهەلبی، وەزیری مۆعێز ئەلدەولە، لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ گرتنی عەممان بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە دەریا، نەخۆشی بەرۆکی گرت. نەخشیەکەی پەرەی سەند تا ئەوەی بەناچاری گەڕاندیانەوە بۆ بەغداد و لەشەعبان/ ئۆگۆست لەرێگە کۆچی دوایی کرد. جەنازەی ئەویان گەڕاندەوە بۆ بەغداد و بەخاکیان سپارد. مۆعێز ئەلدەولە،سامان

و پاشـەکەوتەکانی ئـەوی زەوت کـرد و بنەماڵـە، هـاوەڵان، کەسـانی دەوروبـەر و تەنانەت خزمەتکارەکانی ئەوی گرت و زیندانی کردن. خەڵکان ئەم کارەی ئەویان بەنەشیاو و ناپەسەند لەقەڵەمدا.

وەزارەتـی موهـەلبی سـیانزە سـاڵ و سـێ مـانگ درێـژەی کێشا. ئـەو پیـاوێکی بەخـشندە، بیرمەنـد، فـرەزان و جـوامێر بـوو. بەمـەرگی ئـەو بەخـشندەییش کۆچـی کرد.

دوای موهـەلبی، بـاوکی فـەزڵ عـەباس کـوڕی حسـەینی شـیرازی و بـاوکی فـەرەج محەممـەد کـوڕی عـەباس کـوڕی فەسـانجس بـێ ئـەوەی نـاوی یـەکیان وەك وەزیـر دەستنیشان بکرێت، کاروبارەکانیان بەرێوە دەبرد.

## هێرش بۆ رۆم و یاخیبوونی خەڵکانی حەران

لەشـەوال/ ئۆکتۆبـەری ئـەم سـاڵە خـەڵکانی تەرسـوس بـۆ جـەنگی رۆمییـەکان بەرێکەوتن. نـەجا، کۆیلـەی سـەیف ئەلدەولـە کـوڕی حەمـدان، لەرێگەیـەکی دیکـەوە پۆشـتە سـەرزەمینی رۆم و سـەیف ئەلدەولـە لەبـەر نەخۆشـی خـۆی هاورێیـەتی نەکردن لەبەر ئەمە لای دەروازەیەك لەدەروازەکان مایەوە. تەرسوسیەکان تـا قونییـە پێشرەوییان کرد و دواتر گەڕانەوە. سەیف ئەلدەولە بۆ حەلەب گەڕایـەوە و لەرێگـە بێهـۆش بـوو. گومانیـان کـرد مـردووە و هـەواڵی مـەرگیان بـڵاو کـردەوە. هیبـە الله کوڕی برای سـەیف ئەلدەولـە، یـانی ناسـر ئەلدەولـە کـوڕی حەمـدان، هێرشـی کـردە سـەر کوڕی دنجـای مەسـیحی و کوشـتی. کـوڕی دنجـا یـەکێك لەکەسـە نزیکـەکانی سـەیف ئەلدەولـە بـوو و لەسـەر دەسـتی هیبـە الله کـوژرا چـوونکە دەسـتدرێژ کـردە سەر کۆیلەکەی و هیبە الله نەیتوانی بەمە رازی بێت.

لەم کاتەدا سەیف ئەلدەولە هاتە هۆش و کاتێك هیبە الله ئەمەی زانی، بۆ حەران هـەڵات. کاتێك پۆشـتە شـارەکە وای بـلاو، کـردەوە کـەمامی مـردووە و داوای لـەوان کرد سوێند بخۆن تا هاورێیەتی هەرکەسێك بکات، هاورێیەتی بکـەن و دوژمنایـەتی هەر کەسێکی کرد، دوژمنایەتی بکەن. ئەوان سوێندیان خـوارد بـەڵام مـامی ئـەویان لەم سوێندە بەدەرکرد. سـەیف ئەلدەولـە، کۆیلەکـەی، نـەجای بەشـوێن هیبـە الله بۆ

حەڕان نارد. کاتێك نەجا لەحەران نزیك کەوتەوە، هیبە الله شارەکەی بەجێهێشت و رووی کردە موسڵ تا پەیوەستی باوکی بێت. نەجا لەبیست و حەوتی شەوال/ بیست و یەکی ئۆکتۆبەر گەیشتە حەڕان. بەیانی ئەو رۆژە خەڵکانی حەڕان هێرشیان کردەسەر. نەجا هەموویانی گرت و ویستی هەزار درهەمیان لێ بستێنێت. کەسانێکی وەك چاودێری ئەواندا تا ئەو برە پارە لەماوەی پێنج رۆژدا کۆبکەنەوە. نەجا فەرمانیدا لەبەرابەر چاوی بنەماڵەکانیان، ئەشکەنجەی پیاوەکان بدەن. ئەوانیش کالاکانی خۆیان بۆ فرۆش دانا و ئەوەی بەهاکەی یەك دینار بوو، بەیەك درهەم دەیانفرۆشت چوونکە هەموو شارەکە بۆ کۆکردنەوەی ئەو برە پارە فرۆشیار بوو و کڕیار لەناو ئەواندا نەدەبینرا و هاوەڵانی نەجا ئەم کالایانەیان بەبەهای دڵخوازی خۆیان دەکڕی. نەداری و هەژاری بەرۆکی دانیشتووانی شارەکەی گرت و نەجار رێگەی مەیافارقینی گرتەبەر و حەرانی بەسەرگەردانی و بێ فەرمانڕەوا بەجێهێشت. سەرسەریی و ئاژاوەچییەکان بەسەر خەڵکدا زاڵ بوون و ئەو بەلایە بەسەر نەجا هات کە لەگێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی ٣٥٣/٩٦٤ زایینی ئاماژەی پێدەدرێت.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەدەی موحەرەم/ دەی مارسی ئەم ساڵە مۆعیز ئەلدەولە فەرمانی بەخەڵکاندا دووکانەکانی خۆیان ببەستن و بازارەکانی کڕین و فرۆش پشت گوێ بخەن و پرسە بگێڕن، عابایەکی پەشمین بخەنە سەرشان و ژنەکان قژی خۆیان پەرێشان و روخساریان رەش بکەن و یەخەی خۆیان بدڕن و بۆ بیرکردنەوەی حسەین کوڕی عەلی، لەخۆیان بدەن. خەڵکان ئەو کارەیان کرد و سوونی مەزهەبەکان توانای رێگرتن لەو کارەیان نەبوو چوونکە ژمارەی شیعەکان زۆر و حکومەت لەدەستی ئەواندا بوو.

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە دەستەیەکی گەورە لەپیاوانی ئەرمەنستان کۆبوونەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر رۆهایان کرد و تالانی زۆریان کۆکردەوە و ئەسیریان کرد و لەگەڵ سامانە فراوانەکان گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا کوڕی باوکی شوارب، پێگەی قازی بەغدادی لێ سەندرایەوە و باوکی بیشر عەمرۆ کوڕی ئەکستەم جێگەی ئەوی گرتەوە. باوکی بیشر لەدانی ئەو بڕە پارە دیاریکراوەی کوڕی باوکی شوارب دەیدا، دوورخرایەوە و دەفتەر و داوەرییەکانی ئەو کە لەسەر بنەمای (باج) دەکرا بەناڕەوا لەقەڵەم درا.

لەشەعبان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە رۆمییەکان دژی پاشاکەی خۆیان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و کوشتیان و کەسێکی دیکەیان لەجێگەی ئەودانا و کوڕی شەمشقیق فەرماندەیی گرتەدەست. کوڕی شەمشقیق ئەو کەسەیە هەموان بەکوری شەمشەکی ناوی دەبەن.

لەهەژدەی زیحەججە/ نۆی ژانویەی ئەم ساڵە مۆعیز ئەلدەولە فەرمانیدا شارەکە برازێننەوە و لەبەردەم شوێنی پاسەوانەکان ئاگر هەڵگیرسێنن و شادی بگێڕن و بازارەکان شەوانە کراوە بن بەهەمان شێوە کەشەوانی جەژن بازارەکان کراوە بوو. ئەم جەژنەی لەبەر جەژنی غەدیری خوم رێکخست. تەپڵ و شەیپورەکان هاتنەدەنگ. رۆژێکی سەرنج راکێش بوو.

لەزیحەججە/ دێسامبەری (کانونی دووەم) ئەم ساڵە خەڵکی عێراق لەبەر بێ بارانی و بەمەبەستی باران بارین، بۆ نوێژە بارانە لەشارەکە هاتنەدەر.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پەنجا و سێی کۆچی ( ٩٦٤ زایینی )

سەرکێشی نەجا و کوژرانی ئەو و زاڵ بوونی سەیف ئەلدەولە لەسەر چەندین بەشی ئەرمەنستان

لەم ساڵەدا ڕۆمییەکان دەستیان بەسەر مەسیسە و تەرسوسدا گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: نەقفور، پاشای ڕۆم، لەقیسارییە بناغەی شارێکی دارشت تا لەسەرزەمینە ئیسلامییەکان نزیك بێت و لەو شارە مایەوە و بنەماڵەکەیشی بۆ ئەو شارە برد. خەڵکانی مەسیسە و تەرسوس نوێنەرێکیان بۆ لای ئەو نارد و وتیان: ئامادەن باج و خەراجی پێبدەن و داوایان لێکرد دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکات تا لەناو ئەواندا بمێنینەوە. نەقفور بەداواکەیان ڕازی بوو.

لەم کاتەدا نەقفور ئاگادار بوویەوە خەڵکانی ئەم شارە ناتەوان و لاوازن و پشتیوانیان نییە و گرانی بەرۆکی گرتوون و لەبەدەست هێنانی خۆراك ناتەوان و سەگ و مردوو دەخۆن و نەخۆشییە گشتگیرەکان لەناو ئەواندا زیادی کردووە و ڕۆژانە نزیکەی سێسەد کەسیان لێ دەمرێت. لەبەر ئەمە نەقفور لەبڕیارەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە. ئەو نوێنەرەکەی ئەوانی هێنا و نامەکانی ئەوانی سووتاند و وتی: ئێوە هاوشێوەی مارێکن کە لەزستان سست و دەژاکێت تا ئەو جێگەی لەمردن نزیك دەبێتەوە و ئەگەر مرۆڤ هەڵیگرێت و گەرمای پێببەخشێت، گازی لێدەگرێت و دەیکوژێت. ئێوە لەبەر ناتەوانی خۆتان ملکەچی فەرمانەکانی من بوون و ئەگەر پشتگوێتان بخەم تا هێزی خۆتان بەدەست بێننەوە، ئازارم دەدەن.

ئەو نێردراوی گەڕاندەوە. سوپای ڕۆمی کۆکردەوە و خۆی وەك فەرماندەی سوپا ڕێگەی مەسیسەی گرتەبەر و ناکاوگیری کرد و لەرۆژی شەممە، سیانزەی ڕەجەب/ شانزەی جولای بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی کوشت. دواتر شمشێری هەڵگرت و پاشماوەی ئەسیرەکانی بۆ ڕۆم نارد. ژمارەی ئەم خەڵکە نزیکەی دووسەد هەزار کەس بوو. دواتر بەرەو تەرسوس بەرێکەوت و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و خەڵکی ئەو شارە ملکەچی خۆیان نیشاندا و داوای ئەمانیان کرد. ئەو، ئەمانی پێبەخشین و

ئەوان دەروازەی شارەکەیان بۆ کردەوە. نەقفور چاکەی لەگەڵ کردن و فەرمانی پێدان هەرچی کەرەستەی جەنگ و سامان کەدەیتوانن لەگەڵ خۆیان هەڵیگرن و شارەکە و کاڵاکانی دیکە بەجێبێڵن. دانیشتووان ئەو کارەیان کرد و لەئاو و وشکانی ملی رێگەیان گرتەبەر. نەقفور دەستەیەکی بۆ پاراستن لەگەڵ ئەوان نارد تا گەیشتنە ئەنتاکییە.

نەقفور مزگەوتی تەرسوسی کردە تەویلەی چوارپێکان و مینبەرەکەی سووتاند و تەرسوسی سەنگەر بەندی کرد و خواردەمەنییەکی زۆری بردە شارەکە و نرخی کەل و پەلەکان دابەزی و ژمارەیەکی فراوان لەخەڵکی شارەکە گەڕانەوە و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نەقفور نیشاندا. ژمارەیەکیشیان باوەڕیان بەئایینی مەسیحی هێنا.

نەقفور دەیویست بۆ نزیك بوونەوە لەسەرزەمینە ئیسلامییەکان لەوێ بمێنێتەوە بەلام دواتر لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە و بۆ قوستەنتینە گەڕایەوە. لەم کاتەدا دوموستوق، کوڕی شەمشقیق مەبەستی مەیافارقینی کرد کە لەژێر فەرمانی سەیف ئەلدەولەدا بوو. نەقفور فەرمانی پێدا چاوپۆشی لەو شارە بکات و بەدوای ئەو بەرەو قوستەنتەنییە بەرێکەوێت. دوموستوق بەرەو قوستەنتەنییە بەرێکەوت.

## ناسازگاری خەڵکانی ئەنتاکییە لەگەڵ سەیف ئەلدەولە

لەم ساڵەدا خەڵکانی ئەنتاکییە دژی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: سەردارێك لەتەرسوس بەناوی رەشیقی نەسیمی لەژمارەی ئەو کەسانە بوو کەشارەکەی تەسلیم بەرۆمییەکان کرد و رێگەی ئەنتاکییەی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە ئەو شارە، پیاوێك بەناوی کوڕی ئەهوازی کە لەئەنتاکییە ئاشی بەکرێ دەدا، خزمەتی ئەوی دەکرد و هەموو داهاتی ئاشەکانی دەخستە بەردەستی ئەو و شۆڕشی لەبەرچاوی ئەودا ئاسان کرد و ئاگاداری کردەوە کەسەیف ئەلدەولە لەمەیافارقین توانای گەڕانەوە بۆ شامی نییە. ڕەشیق ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و بەسەر ئەنتاکییەدا زاڵ بوو و لەوێوە بەرەو حەلەب

بەرێکەوت و لەنێوان ئەو و نوێنەری سەیف ئەلدەولە، چەندین جەنگ روویدا. قەرغویە رۆشتە قەڵای حەلەب و لەوێ سەنگەری گرت. سەیف ئەلدەولە سوپایەکی بەفەرماندەیی خزمەتکارەکەی خۆی، بەشارە بۆ هاوکاری قەرغویە رەوانە کرد. کاتێك رەشیق لەمە ئاگادار بوویەوە، لەحەلەب هەڵات. لەم کاتەدا لەئەسپەکەی خۆی کەوتە خوار و پیاوێکی عەرەب خۆی پێگەیاند و کوشتی و سەرەکەی بردە لای قەرغویە و بەشارە.

کوڕی ئەهوازی گەیشتە ئەنتاکییە. ئەو پیاوێك لەدەیلەمییەکانی بەناوی دزبەر پێش خست و بەئەمیر ناوی برد و یەکێك لەعەلەوییەکان بەناوی ئوستازی بۆ پشتیوانی کردنی دزبەر راسپارد. کوڕی ئەهوازی ستەمی لەخەڵکان دەکرد و سامانەکانی کۆکردەوە بۆ جەنگ لەگەڵ قەرغویە مەبەستی ئەنتاکییەی کرد. لەنێوان ئەم دووانە جەنگێکی قورس روویدا. سەرەتا کوڕی ئەهوازی سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەڵام دواتر جەنگ لەبەرژەوەندی قەرغویە کۆتایی هات و کوڕی ئەهوازی بۆ حەلەب هەڵات.

لەم کاتەدا سەیف ئەلدەولە دوای ئاسوودە بوون لەجەنگی مەیافارقین بۆ حەلەب گەڕایەوە و شەوێك لەوێ مایەوە و بەیانی ئەو رۆژە بەرێکەوت و لەگەڵ دزبەر و کوڕی ئەهوازی جەنگا. جەنگی لەگەڵ هەموو حەلەبییەکان کرد و ئەوان بەهەڵاتن ناچار بوون و دزبەر و کوڕی ئەهوازی ئەسیر کران. دزبەر کوژرا و کوڕی ئەهوازی زەمانێکی لەزینداندا بەسەر برد و دواتر کوشتیان.

## شۆڕشی خەڵکانی سەجستان

لەم ساڵەدا خەڵکانی سەجستان دژی فەرمانڕەواکەی خۆیان، خەلەف کوڕی ئەحمەد، شۆڕشیان کرد. خەلەف لەم کاتەدا فەرمانڕەوای سەجستان بوو. ئەو پیاوێکی زانا و لایەنگری زاناکان بوو.

بەرێکەوت لەساڵی ٣٥٣/٩٦٤ زایینی رۆشتە ماڵی خوا و یەکێك لەهاوەڵانی خۆی بەناوی تاهیر کوڕی حسەین وەك نوێنەری خۆی لەو سنوورە دانا. تاهیر چاوی تەماحی بڕییە فەرمانڕەوایەتی و کاتی گەڕانەوەی خەلەف لەحەج، دژی ئەو

شۆڕشی کرد. خەلەف ڕۆشتە بوخارا و داوای هاوکاری لەئەمیر مەنسور کوڕی نوح کرد. مەنسور ئەوی بۆ سنوورەکەی گەڕاندەوە و سوپایەکی خستە بەردەست. خەلەف لەگەڵ ئەو سوپایە ڕێگەی سەجستانی گرتەبەر. کاتێك تاهیر لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، لەشارەکەی خەلەف بەرەو ئەسفرار هەڵات و لەسنوورەکەی خۆی جێگیر بوو و بڵاوەی بەسوپاییەکان کرد.

کاتێك تاهیر لەبڵاوبوونەوەی سوپاییەکان ئاگادار بوویەوە، بەرەو خەلەف گەڕایەوە و دەستی بەسەر سەجستاندا گرت و خەلەف شارەکەی بەجێهێشت و ڕۆشتە لای ئەمیر مەنسور لەبوخارا. ئەمیر مەنسور ڕێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد و دووبارە سوپایەکی خستە بەردەستی و بۆ سەجستانی گەڕاندەوە. گەیشتنی خەلەف بۆ سەجستان هاوکات بوو لەگەڵ مەرگی تاهیر و جێگری کوڕەکەی حسەین. خەلەف گەمارۆی خستە سەر حسەین و بارودۆخی لێ دژوار کرد. ژمارەیەکی فراوان لەهەردوو سوپا کوژران و سەرئەنجام، خەلەف سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کاتێك حسەین ئەم بارودۆخەی بینی، نامەیەکی بۆ بوخارا نووسی و بێزاری لەکارەکەی خۆی دەربڕی و داوای بەخشینی کرد و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکان نیشاندا و داوای لەئەمیر مەنسور کرد چاوپۆشی لەگوناحەکەی بکات. ئەمیر مەنسور بەداواکەی ڕازی بوو و فەرمانی پێدا بڕواتە بارەگاکەی. حسەین لەسەجستانەوە بەرەو بوخارا بەڕێکەوت و ئەمیر مەنسور ڕێزی گرت.

خەلەف کوڕی ئەحمەد لەسەجستان مایەوە و بۆ ڕۆژگارێکی درێژ فەرمانڕەوایەتی دەکرد و سامانی پیاوەکانی فراوان بوو. کاتێك هێز و توانای خۆی بینی، چیتر دیاری و ئەو کۆیلانەی بەڵێنی ڕەوانە کردنی ئەوانیدابوو، پشت گوێ خست. سوپایەك بۆ جەنگی ئەو ئامادە کرا و هەمان حسەین کوڕی تاهیر کوڕی حسەین وەك فەرماندەی ئەم سوپایە دەستنیشان کرا. سوپا بەرەو سەجستان بەڕێکەوت و خەلەف کوڕی ئەحمەد لەقەڵای ئەرەك ناکاوگیر کرا. ئەم قەڵایەك یەکێك لەبەهێزترین قەڵاکان و لەشوێنێکی بەرز و بڵند جێگیر ببوو. ئەم گەمارۆیە حەوت ساڵ درێژەی کێشا و خەلەف بەکەرەستە جۆراوجۆرەکانی جەنگ، سەرقاڵی شەڕ بوو و هەموو فریوێکی بەکار برد تا ئەو جێگەی فەرمانی

دەدا مار بگرن و بیانخەنە ناو مەشكێك و بەبەردهاوێژ بۆ ناو سوپای دوژمنی بهاون. لەبەر ئەمە سوپاكەی تاهیر بەردەوام شوێنیان دەگۆڕی.

كاتێك ئەم گەمارۆیە درێژەی كێشا و سامانەكان و كەرەستەكانی جەنگ كۆتاییان پێهات، نوح كوڕی مەنسور نامەیەكی بۆ حەسەن كوڕی سیمجور فەرماندەی سوپای خوراسان -ئامارژەی پێدەدەرێت كە لەو كاتەدا لەسەر كار لابرابوو- نووسی و فەرمانی پێدا بۆ جەنگی خەلەف بەرێكەوێت و گەمارۆی بخاتەسەر. سیمجور لەم كاتەدا لەقوهستان بوو، رووی كردە سەجستان و گەمارۆی خستە سەر خەلەف. پێشتر ئەو دووانە هاورێی یەكبوون. سیمجور، باوكی حەسەنی بۆ لای خەلەف نارد و داوای لێكرد لەقەلای ئەرەك بێتەخوار و تەسلیم بەحسەین كوڕی تاهیری بكات تا ئەو سوپایەی گەمارۆی خستۆتە سەر، بەلگە و پاساوی گەڕانەوە بۆ بوخارایان دەستكەوێت و كاتێك سوپاییەكان بلاوەیان لێكرد، ئەو دووبارە جەنگ لەگەل حسەین و بەكر كوڕی حسەین - بێ سوپا- دەست پێ بكاتەوە. خەلەف بەم بۆچوونە رازی و لەقەلای ئەرەك بەرەو قەلای تارق بەرێكەوت و باوكی حەسەنی سیمجوری ڕۆشتە ناو قەلاكە و بەناوی ئەمیر نوح وتاری خوێندەوە و دواتر گەڕایەوە و حسەین كوڕی تاهیری لەوێ بەجێهێشت.

ئەوەی دوای ئەمە روویدا، ئامارژەی پێدەدەین و ئەمە یەكەم كەلێن بوو لەحكومەتی سامانیدا دروست بوو كەفەرمانڕەوای ناوچەكان چاوی تەماحیان بڕییە سەربەخۆیی چوونكە بەشێك لەوان ملكەچی فەرمانەكان نەدەبوون.

شیاوتر بوو هەر ڕووداوێك لەسالی خۆیدا ئامارژەی پێبدرێت بەلام لەبەر كەمی و كورتی ئەم ڕووداوانە، هەموویمان لەیەك جێگەدا كۆكردەوە تا سەرەتا و ئەنجامەكەی نەپچڕێت.

## گوێڕایەڵی خەڵکانی عەممان لەمۆعیز ئەلدەولە و سەرئەنجامی کاری ئەوان

لەم ساڵەدا مۆعیز ئەلدەولە سوپایەکی بۆ عەممان ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە ڕووبەڕووی فەرمانڕەوای عەممان، نافیع، موالی یوسف کوڕی وەجیە بوویەوە چوونکە یوسف پێشتر مردبوو و نافیع دوای ئەو لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. ئەو کەپیاوێکی ڕەشپێست بوو، ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی مۆعیز ئەلدەولە نیشاندا و بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە و ناوی ئەوی لەسەر درهەم و دینارەکان هەڵکەند. کاتێك سوپای مۆعیز ئەلدەولە شارەکەیان بەجێهێشت، خەڵکانی عەممان دژی نافیع شۆڕشیان کرد و ئەویان لەشارەکەیان دوور خستەوە و قەرەمتییەکانیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد و شارەکەی خۆیان بەوان سپارد. قەرەمتییەکان ڕۆژانە لەناو شارەکە دەمانەوە ولێکۆڵینەوەیان لەکاروبارەکان دەکرد وشەوانە بۆ ئوردووگای خۆیان دەگەڕانەوە. قەرەمتییەکان نامەیان بۆ هاوەڵانی خۆیان لەهەجەر نووسی و ئاگاداریان کردنەوە: ئێمە دەستمان بەسەر ئەم پانتاییەدا گرتووە و ڕۆژگاری ئێمە بەم شێوەیە بەسەر دەچێت.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا، شەوی شەممە، چواردەی سەفەر/ بیستی فەوریە، مانگ بەتەواوی گیرا.

لەم ساڵەدا دەستەیەك لەتورکەکان هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی خەزەر. خەزەرییەکان داوای هاوکارییان لەخوارەزمییەکان کرد. بەڵام ئەوان هاوکارییان نەکردن و وتیان: ئێوە کافر و ناباوەڕن، ئەگەر باوەڕ بەئیسلام بێنن، هاوکاریتان دەکەین. هەموویان باوەڕیان بەئیسلام هێنا جگە لەپاشاکەیان. خوارەزمییەکان هاوکارییان کردن و ئەوان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و تورکەکانیان دوورخستەوە. دواتر پاشاکەیشیان باوەڕی هێنا.

لەچواری جومادی الاخرە/ هەشتی جونی ئەم ساڵە شەریف باوکی ئەحمەد حسەین کوڕی موسا باوکی شەریف رضی و شەریفی مرتضی پێشەوایی عەلەوییەکان و سەرکردایەتی حاجییەکانی گرتە ئەستۆ و لەدیوانی خەلیفەوە، فەرمان نامەیەکی لەمبارەوە بۆ نووسرا.

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان دەستەیەکیان بۆ عەممان نارد. شارییان (کرێارانی نەفسی خۆ) لەچیاکانی ئەم کەنارە ژیانیان بەسەر دەبرد. هەموویان کۆبوونەوە و روبەرووی قەرەمتییەکان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و ئەوەی زیندوو مایەوە، گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەقەرەمتییەکان کەئەمانی لەسەیف ئەلدەولە وەرگرتبوو بەناوی مەروان، بەنوێنەرایەتی سەیف ئەلدەولە فەرمانڕەوایەتی کەنارەکانی گرتەدەست و کاتێك لەوێ جێگیر بوو، هێرشی کردە سەر حیمس و دەستی بەسەردا گرت و چەندین شاری دیکەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە. کۆیلەی قەرغویە، پەردەداری سەیف ئەلدەولە، بەناوی بەدر، بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت و چەندین جار رووبەرووی مەروان بوویەوە. لەیەکێك لەجەنگەکان بەدر، تیرێکی ژەهراوی لەجەستەی مەروان چەقاند و لەم کاتەدا سوپاکەی مەروان، بەدریان گرت و مەروان کوشتی و خۆی چەند رۆژ دوای کوشتنی ئەو مرد.

لەم ساڵەدا موتەنەبی وتاردەر بەناوی باوکی تەییب ئەحمەد کوڕی حسەینی کێندی لەنزیك نەعمانییە کوژرا و کوڕەکەیشی لەگەڵ ئەودا کوژرا. ئەو بۆ لای عێزەد ئەلدەولە لەفارس دەگەڕایەوە کەعەرەبەکان لەوێ کوشتیان و سامانەکەیان تالان کرد.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی حیبان کوڕی ئەحمەد کوڕی حیبان باوکی حاتەمی بۆستی، نووسەری چەندین کتێبی بەناوبانگ و ئەبوبەکر محەممەد کوڕی حەسەن کوڕی یەعقوب کوڕی موقسیم، لێکدەرەوەی نەحوی و موقری کەشارەزای نەحوی کوفی بوو، هەردووك مردن. محەممەد کوڕی عەبدولله کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدویە ئەبوبەکری شافعی لەزیحەججە/ نۆڤەمبەر کۆچی دوایی کرد. حەدیسەکانی ئەو بڕواپێکراوە و پێگەیەکی بەرزی هەیە.

## ڕووداوەکانی ساڵی پێنسەد و پێنجی کۆچی ( ٩٦٦ زایینی )

## ڕووداوە تازەکان لەعەممان و زاڵبوونی مۆعیز ئەلدەولە لەوێ

گێڕانەوەکانی تایبەت بەعەممان و ڕۆشتنە ناوەوەی قەرەمتییەکان بۆ ئەم سەرزەمینە و هەڵاتنی نافعمان لەوێ لەکاتێ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی رابردوو باس کرد. کاتێك نافع هەڵات و قەرەمتییەکان بەسەر شارەکەدا زاڵبوون، دەبیرێك لەناویاندا دەبینرا بەناوی عەلی کوڕی ئەحمەد کەلێکۆڵینەوەی لەکارەکانی شار دەکرد. ئەو لەگەڵ قازی شارەکە کەبنەماڵەیەکی گەورە و پێگەیەکی بەرزی بوو، یەکیانگرت و پیاوێکیان وەك فەرماندە دەستنیشان کرد بەناوی کوڕی توغیان. ئەو یەکێك لەسەرکردە بچوکەکانی عەممان هەژمار دەکرا کەپێگەی لەهەموان نزمتر بوو. کاتێك فەرماندەیی گرتەدەست، لەسەرکردە گەورەکان ترساو هەشتا کەس لەوانی گرت و بەشێك لەوانی کوشت و ئەوانی دیکەی لەئاودا خنکاند.

دوو خوشکەزای یەکێك لەسەرکردەکان کەکوڕی توغیان لەئاودا خنکاندبووی، ڕۆشتنە ناو شارەکە و ماوەیەك مانەوە. ڕۆژێك کەتوغیان خوانێکی گشتی ڕاخستبوو، ڕۆشتنە لای و سڵاویان لێکرد و کاتێك دەوری چۆڵ کرا، کوشتیان. خەڵکان بڕیاریاندا عەبدوەهاب کوڕی ئەحمەد کوڕی مەروان کە لەخزمەکانی قازی شارەکە بوو، وەك فەرمانڕەوا هەڵبژێرن. ئەو سەرەتا ڕازی نەبوو بەڵام سەرئەنجام ڕەزامەندی خۆی نیشاندا و عەلی کوڕی ئەحمەدی (لەقەرەمتییەکان) وەك دەبیری خۆی دەستنیشان کرد. عەبد وەهاب فەرمانی بەدەبیرەکەیدا (عەلی کوڕی ئەحمەد) ڕۆژانەی سوپاییەکان وەك پاداشت بدات. عەلی ئەو کارەی کرد بەڵام کاتێك گەیشتە ڕەشپێستەکان – کەژمارەیان شەش هەزار کەس و پێگەیەکی بەرزیان بوو– ، وتی: ئەمیر عەبدوەهاب فەرمانی پێداوم بەسەربازە سپی پێستەکان دووبەرابەری ئێوە ڕۆژانە بدەم. سوپا پەرێشان و لەوەرگرتنی ڕۆژانە خۆی بەدوور گرت. عەلی وتی: ئایا شوێنکەوتەی فەرمانەکانی من دەبن تا هاوشێوەی ئەوان ڕۆژانەتان پێبدەم. ئەوان ڕازی بوون و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. ئەویش هاوشێوەی سپی پێستەکان ڕۆژانەی پێدان و ئەم جارە سپی پێستەکان دەنگی ناسازگارییان بەرز کردەوە و بەمشێوەیە لەناو سپی پێست و ڕەش پێستەکان جەنگ ڕوویدا و ڕەشەکان سەرکەوتنیان

بەدەست هێنا و دواتر پەیمانی ئاشتییان بەست و سپییەکان هێور بوونەوە و لەگەڵ ڕەشەکان یەکیان گرت و عەبدوەهابیان لەشارەکە دەرکرد. عەلی کوڕی ئەحمەد لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت.

دواتر مۆعێز ئەلدەولە بۆ جەنگ لەگەڵ عیمران کوڕی شاهین و ڕەوانە کردنی سوپا بۆ عەممان، ڕێگەی واستی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە واست، نافعی ڕەشپێست کەفەرمانڕەوایەتی عەممانی لەدەستا بوو، پێشوازی لێکرد. مۆعێز ئەلدەولە ڕێزی گرت و ئەو لای مۆعێز ئەلدەولە مایەوە تا عیمران کوڕی شاهین ئەسیر کرا – بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین.

لەم کاتەدا مۆعێز ئەلدەولە لەمانگی ڕەمەزان/ ئۆگۆست لەواستەوە هێرشی کردە سەر ئۆبولە (بەسرە، بەناوی ئەبلیوس سەرداری ئەسکەندەر) و مانگی ڕەمەزانی لەو شارە بەسەر برد و لەوێ بەئامادە کردنی سوپا و کەشتییەکان بەمەبەستی هێرش کردنە سەر عەممان سەرقاڵ بوو. کاتێك کۆتایی بەمەبەستەکەی خۆی هێنا و لەنیوەی شەوال/پێنجی ئۆکتۆبەر سوپاکەی ڕەوانە کرد، باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەباس کوڕی فەسانجسی وەك فەرماندەی سوپاکەی دەستنیشان کرد. سوپا لەناو سەد کەشتی جەنگی جێگیر بوو. کاتێك گەیشتنە سیراف، ئەو سوپایەی عێزەد ئەلدەولە لەفارس ئامادەی کردبوو تا هاوکاری مۆعێز ئەلدەولەی مامی بکات، پەیوەستیان بوو و هەموان ڕێگەی عەممانیان گرتەبەر و لەنۆی زیحەججە/ بیست و حەوتی نۆڤەمبەر گەیشتنە عەممان و دەستیان بەسەردا گرت و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانەکەیان کوشت و هەشتا و نۆ کەشتی ئەوانیان سووتاند و بەناوی مۆعێز ئەلدەولە وتاریان خوێندەوە.

## هەڵاتنی ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان لەئازەربایەجانەوە بەرەو ڕەی هەڵات.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك ئیبراهیم لجەنگ دژی جوستان کوڕی شەرمزەم – بەهەمان شێوە کە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٣٤٩/٩٦٠ زایینی ئاماژەمان پێدا– شکستی خوارد و بۆ ئەرمەنستان هەڵات، لەوێ دەستی بەئامادە کردن و کۆکردنەوەی سوپا کرد تا بۆ ئازەربایەجان بگەڕێتەوە. فەرمانڕەواکانی

ئەرمەنستان بەشێکیان ئەرمەنی و بەشێکیان کورد بوون. ئەو دواتر نامەی بۆ جوستان کوڕی شەرمزەن نووسی و ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر و خەڵکانێکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە.باوکی قاسم کوڕی مەسیکی ڕۆشتە لای وەهسوزان و پەیوەستی بوو. ئیبراهیم هەڕەشەی لەمامەکەی خۆی وەهسوزان کرد بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی دایك و براکانی و هێرشی کردە سەر مامەکەی و ویستی تۆڵەی براکانی بستێنێت. وەهسوزان لێی ترسا و هاوڕێ لەگەڵ کوڕی مەیسەکی بەرەو دەیلەم هەلأت و ئیبراهیم سنوری فەرمانڕەوایەتی مامی خستە ژێر فەرمانی خۆی و هاوەڵانی ئەوی ئازاردا و سامانی ئەوانی زەوت کرد.

وەهسوزان سەر لەنوێ هێزی کۆکردەوە و بۆ قەلأکەی خۆی لەتەرەم گەڕایەوە و باوکی قاسم کوڕی مەیسەکی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی ئیبراهیم ڕەوانە کرد. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. ئیبراهیم شکستی خوارد و هەلأت. دەستەیەك شوێنی کەوتن بەلأم نەیانتوانی بیگرن. ئەو خۆی گەیاندە ڕەی و ڕۆشتە لای ڕۆکن ئەلدەولە. ڕۆکن ئەلدەولە ڕێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. ئەو هاوسەری خوشکی ئیبراهیم بوو. لەبەر ئەمە لەڕێز گرتن لەژن براکەی خۆی زێدەڕۆیی کرد و چەندین دیاری گرانبایی پێبەخشی.

## غازیانی خوراسان و ڕۆکن ئەلدەولە

لەرەمەزان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە سوپایەکی گەورە لەخۆبەخشەکان کەژمارەیان دەگەیشتە بیست هەزار کەس، بەمەبەستی غەزا، ڕێگەی شاری ڕەی یان گرتەبەر. هەواڵەکانی تایبەت بەوان و ژمارەی ئەوان و خراپەکارییەکانیان لەو کەنارە و گوێنەدانی سەرکردەکان و کارگوزارەکان بەرۆکن ئەلدەولە گەیشت. باوکی فەزڵ کوڕی عەمید کەراوێژکاری ئەو بوو، پێشنیاری بەرۆکن ئەلدەولە کرد ڕێگە نەدات ئەم سوپایە بەکۆمەڵ بێنە ناو سەرزەمینەکەی. ڕۆکن ئەلدەولە وتی: من ئەو کارە ناکەم لەترسی ئەوەی نەکا بڵێن لەغازییەکان ترسا. فەرمانیدا سەرقاڵیان بکات تا سوپاکەی خۆی کۆبکاتەوە چوونکە سەربازەکانی لەم لاولادا بلأو ببوونەوە. کوڕی عەمید ڕازی نەبوو و وتی: لەوە دەترسم ئەوان هاوپەیمانی ئەمیری خوراسان بن و دژی ولأت و فەرمانڕەوایەتی تۆ پیلانیان گێڕا بێت بەلأم ڕۆکن ئەلدەولە گرنگی

بەوتەکانی نەدا.

کاتێک ئەم سوپایە ڕۆشتنە ناو ڕەی، سەرکردەکانی ئەوان – کەقەفالی فەقیە لەناویاندا دەبینرا– کۆبوونەوە و لەدانیشتنی کوڕی عەمید ئامادە بوون و داوای سامانیان لێکرد تا بۆ جیهاد تەرخانی بکەن. کوڕی عەمید بەڵێنی پێدان تا ئەو سامانەی داوایان کردبوو، بیخاتە بەردەستیان. ئەوان لەسەر ئەم داوایەی خۆیان پێداگرییان کرد و وتیان: ئێمە خەراجی سەراسەری وڵاتمان دەوێت چوونکە ئەم باجە تایبەتە بەگەنجینە و ئێوە دەزانن ڕۆمییەکان چ بەڵایەکیان بەسەر موسوڵماناندا هێناوە و دەستیان بەسەر سەرزەمینەکەی ئێوەدا گرتووە. ئەرمەنییەکانیش ئەو کارەیان کردووە. ئێمە خۆبەخشە نەدارەکانین و بۆ کەڵک وەرگرتن لەم سامانە لەهەموان شیاوترین. ئەوان داوای سوپایەکیان کرد تا لەگەڵ ئەوان بۆ گۆڕەپانی جەنگ بەرێکەوێت. لەسەر ئەم خواستەیشیان پێداگرییان دەکرد. کوڕی عەمید لەم کاتەدا هەستی بەمەبەستە گڵاوەکانی ئەوان کرد و دڵنیا بوو. بۆ ئەم مەبەستە بەشێوەیەکی نەرم وەڵامی دانەوە. ئەوان چاوپۆشییان لەکوڕی عەمید کرد بەڵام سەرکۆنە و نفرینی دەیلەمییەکانیان کرد و بەکافر لەقەڵەمیاندان. دواتر دانیشتنەکەی کوڕی عەمیدیان بەجێهێشت و بەرواڵەت خۆیان بەکەسانی چاکەکار نیشاندەدا و ڕێگەیان لەخراپەکاری دەگرت. بەم بیانووە دەستیان بەسەر سامانی ئەواندا دەگرت. دواتر ئاژاوەیان نایەوە و جەنگیان لەگەڵ دەستەیەک لەدەیلەمییەکان هەڵگیرساند تا ئەوەی شەو جیایی لەنێوان ئەواندا دروست کرد. بەرەبەیان دووبارە بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر شارەکە و کۆشکی کوڕی عەمیدیان تاڵان و خۆیان برینندار کرد بەڵام ئەو ڕزگاری بوو.

ڕۆکن ئەلدەولە و سوپاکەی بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوتن و لەبەر ئەوەی ژمارەیان کەم بوو، خوراسانییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەجۆرێک ئەگەر شوێنی دەکەوتن، دەیانتوانی لەناوی ببەن و دەست بەسەر شارەکەدا بگرن. بەڵام چوونکە هەوا تاریک بوو، لەو مەبەستە پەشیمان بوونەوە. لەبەرەبەیاندا، ڕۆکن ئەلدەولە نامەیەکی بۆ نووسین و ڕێگەی سازگاری گرتەبەر بۆ ئەوەی لەشارەکە بڕۆنەدەر،

بەڵام ئەوان ئەو کارەیان نەکرد و چاوەڕوانی هێزە پشتیوانەکانی ئەمیری خوراسان بوون چوونکە لەگەڵ ئەو دەستەیە بۆ گرتنی ئەم سەرزەمینە پەیمانیان بەستبوو.

دواتر کۆبوونەوە و مەبەستی گرتنی شارەکەیان کرد. ڕۆکن ئەلدەولە ڕووبەڕوویان بوویەوە و فەرمانی بەدەستەیەك لەهاوەڵانیدا لەشوێنێك کۆببنەوە کەبیانبینێت و لەوێوە هێرش بەرن و بەدرۆ پێی بڵێن هێزە پشتیوانەکان گەیشتن. ئەم دەستەیە فەرمانەکەیان ئەنجامدا چوونکە سوپاکەی ڕۆکن ئەلدەولە لەکەمی ژمارەی خۆیان و فراوانی دوژمن دەترسان. کاتێك دەستەی دیاریکراو بەبەرز کردنەوەی تەپ و تۆز هاتنە لای ڕۆکن ئەلدەولە و هەواڵی درۆینەی هاتنی هێزە پشتیوانەکانیان پێدا، ورەی سوپاکەی بەرز بوویەوە. ڕۆکن ئەلدەولە فەرمانی پێدان: هێرش بکەنە سەر دوژمن تا پێش گەیشتنی هێزەکانمان بەتەواوی لەناویان ببەین و سەرکەوتن و تالانییەکان تایبەت بکەین بەخۆمان. سوپای ڕۆکن ئەلدەولە بەدەم وتنەوەی تەکبیر هێرشیان کرد و سەرکەوتنیان لەئامێز گرت. خوراسانییەکان هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا و زیاتر لەکوژراوەکان ئەسیر کران. پاشماوەکان هەرکام بەرەو ناوچەیەك ئەسپی غاردا و هەمووان داوای ئەمانیان کرد. ڕۆکن ئەلدەولە ئەمانی پێبەخشین.

دەستەیەك لەسوپای خوراسان ڕۆشتبوونە ناو شاری ڕەی و دەنگی تەکبیریان بەرز کردبوویەوە و وایان نیشان دەدا دژی خوراسانییەکان دەجەنگن، بەڵام هەرکەسێکی دەیلەمییان دەگرت، دەیانکوشت و بەرافیزە (رافضة) ناویان دەبردن. ئەوان لەهەواڵی تێکشکانی سوپاکەیان ئاگادار بوونەوە، دەیلەمییەکان هێرشیان کردنەسەر بەڵام ڕۆکن ئەلدەولە ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن و ئەمانی بەدوژمنەکانی بەخشی و ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ کردنەوە. دواتر نزیکەی دوو هەزار سەربازی خۆبەخشی دیکە بۆ هاوکاری کردنی سوپای خوراسان گەیشت. ڕۆکن ئەلدەولە ڕووبەڕووی ئەوانیش بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. دواتر ئەسیرەکانی ئازاد کرد و پارەیشی پێدان و ئەوانی بۆ سەرزەمینەکانیان گەڕاندەوە. ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان لەو کاتەدا لای ڕۆکن ئەلدەولە بوو. بەشداری جەنگەکانی کرد و بوێری لەخۆی نیشاندا و ناو و نیشانێکی جوانی لەخۆی بەجێهێشت.

## گەڕانەوەی ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان بۆ ئازەربایەجان

لەم ساڵەدا ئیبراهیم کوڕی مەرزوبان بۆ ئازەربایەجان گەڕایەوە و دەستی بەسەردا گرت.

چۆنیەتییەکەی -وەك ئاماژەی پێدرا- بەم شێوە بوو: کاتێك پەنای بۆ رۆکن ئەلدەولە برد، رۆکن ئەلدەولە سوپایەکی بۆ ئامادە و باوکی فەزڵ کوڕی عەمیدی لەگەڵ نارد تا دووبارە ئیبراهیم لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجان دابنێت و پەیمانی لەهەمووان بۆ وەربگرێت. ئیبراهیم لەگەڵ کوڕی عەمید بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوت و دەستی بەسەردا گرت. فەزڵ کوڕی عەمید لەنێوان ئیبراهیم و جوستان کوڕی شەرمزەن ئاشتی سەقامگیر و بەفەرمانبەری کردنی ئیبراهیم ناچاری کرد. بەهەمان شێوە کوردەکانیشی ملکەچی فەرمانەکان و ئەو سەرزەمینەی خستە ژێر فەرمانەکانی ئیبراهیم.

کوڕی عەمید کاتێك گەیشتە ئەوێ و فراوانی داهات و ئاوی فراوان و سوودی زۆری ئیبراهیمی لەم سەرزەمینە بینی و ئەوی بەکەسێکی ناتەوان دەزانی و دڵنیا بوو لەوەی خەڵکان بەهۆی شەهوەت پەرەستی ئیبراهیم چاوی تەماحیان بڕیوەتە دەسەڵاتەکەی، نامەیەکی بۆ رۆکن ئەلدەولە نووسی و لەبارودۆخ ئاگاداری کردەوە. پێشنیاری کرد فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینێکی دیکە بەئیبراهیم بسپێردرێت کەداهاتەکەی هاوسەنگی ئازەربایەجان بێت چوونکە ئەو ناتوانێت لەگەڵ پیاوەکانی ئەم سەرزەمینە هەڵکات. رۆکن ئەلدەولە بەپێشنیارەکەی رازی نەبوو و وتی: نامەوێت بوترێت کەسێك پەنای بۆ من هێناوە و من چاوی تەماحم بڕیوەتە دەسەڵاتەکەی. فەرمانی بەکوڕی عەمیددا بگەڕێتەوە و وڵات بەئیبراهیم بسپێرێت.

باوکی فەزڵ گەڕایەوە و رۆکن ئەلدەولەی لەهەموو شتێك ئاگادار کردەوە و پێی وت سەرئەنجام فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینە لەدەستی ئیبراهیمدا نامێنێت. دەرئەنجام بەوشێوەی لێهات کەباوکی فەزڵ پێشبینی کردبوو. ئیبراهیم قۆڵبەست و زیندانی کرا. ئاماژە بەچەند و چۆنی ئەم رووداوە دەدەین.

## هێرشی ڕۆمییەکان بۆ سەرزەمینە ئیسلامییەکان

لەشـەوال/ سـێپتامبەری ئـەم سـاڵە ڕۆمییـەکان، مەبەسـتی شـاری ئامـەد (دیاربـەکر)یـان کـرد و گـەمارۆیان خـستەسەر و جـەنگیان دژی دانیـشتووانەکەی دەسـت پێکـرد بـەڵام سێـسەد کـەس لـەهێرش بـەران کـوژران و چوارسـەد کەسـیان ئەسیر کران و نەیانتوانی دەست بەسەر شارەکەدا بگرن. لەبەر ئەمە ڕوویـان کـردە دارا و لەنەسـیبین نزیـك بوونـەوە. لەرێگـە ڕووبـەڕووی کاروانێـك بوونـەوە کـە لەمەیافارقینەوە دەهات. کاروانەکەیان تاڵان کرد و خەڵکی نەسیبین لەترسی ئەوان هەڵاتن تا ئەو جێگەی کرێی یەك چوارپێ گەیشتە سەد درهەم.

سـەیف ئەلدەولـە نامەیـەکی لەعەرەبـە دەشـتەکییەکانەوە پێگەیـشت کـەداوایان کردبوو لەگەڵ ئەوان ڕێگەی هەڵاتن بگرێتەبەر. سەیف ئەلدەولە هێشتا لەنەسیبین بوو، بەڵام ڕۆمییەکان پێش هـەڵاتنی ئـەو گەڕانـەوە. سـەیف ئەلدەولـە لەشوێنەکەی خـۆی مایـەوە و ئـەوان لەجـەزیرەوە ڕێگـەی شـامیان گرتەبـەر و لەئەنتاکییـە ئوردوویـان لێـدا و ماوەیـەکی دووروودرێـژیان بەجـەنگ لەگـەڵ دانیـشتووانی ئـەم سەرزەمینە بەسەر بردو سەرئەنجام توانیـان دەسـتی بەسـەردا بگـرن. دوای گـرتنی شارەکە، وێران و تاڵانییان کرد و بۆ تەرسوس گەڕانەوە.

## بەسەرهاتی مۆعیز ئەلدەولە لەگەڵ عیمران کوڕی شاهین

پێشتر ئاماژەمان پێدا مۆعیز ئەلدەولە بۆ سەرکوت کردنی عیمران کـوڕی شـاهین بـەرەو بـەتائیح (واسـت) بەرێکـەوت. کاتێـك مـۆعیز ئەلدەولـە گەیـشتە واسـت، سوپایەکی بەفەرمانـدەیی بـاوکی فـەزڵ عـەباس کـوڕی حەسـەن بـۆ جـەنگی عیمـران ڕەوانـە کـرد. سـوپا بەرێکـەوت و گەیـشتە جامیـدە و ئـەو ڕووبارانـەی بەسـت کەدەرژانە واست.

مۆعیز ئەلدەولە خۆی بـەرەو ئوبولـە بەرێکەوت و لـەوێوە سـوپایەکی بـۆ عـەممان نارد – ئاماژەی پێدەدرێت– دواتـر بـۆ کۆتـایی هێنـان بەجـەنگی عیمـران بـۆ واسـت گەڕایەوە و دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت و لـەوێ ئوردووی لێدا. بـەڵام نـەخۆش کەوت و بەناچاری لەبیست و هەشـتی ڕەبیـع الاوەلـی ٣٥٦/ دوانـزەی مارسـی ٩٦٦

زایینی بۆ بەغداد گەڕایەوە و سوپاکەی لەوێ بەجێهێشت و بەڵێنی پێدان بەزوویی دەگەڕێتەوە بەلام کاتێك گەیشتە بەغداد، مرد – ئاماژەی پێدەدرێت– بەم شێوەیە سوپاکەی جگە لەسازان لەگەڵ عیمران هیچ ڕێگە چارەیەکیان بۆ نەمایەوە و دەستیان لەجەنگ هەڵگرت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مناڵەکاتی سولەیم هێرشیان کردە سەر حاجییەکانی میسر و شام کەژمارەیان زۆر و سامانێکی فراوانیان پێبوو. زۆری حاجییەکان لەبەر ئەوە بوو ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانی سنوورەکانی شام لەترسی ڕۆمییەکان لەگەڵ کەسان و سامانی خۆیان هەڵاتبوون و ڕێگەی مەککەیان گرتبووە بەر تا بگەنە عێراق بەلام گرفتار بوون و ژمارەیەکی بەرچاو لەپیاوەکانیان لەبیابان کوژران و تەنیا کەمێکیان ڕزگاری بوو.

لەم ساڵەدا پێگەی باوکی عەبدوللەی داعی، لەدەیلەمییەکان، بەرز بوویەوە. ئەو پەشمینەی دەپۆشی و خوّی بەخواپەرەست و خۆپارێز نیشان دەدا. ئەو ڕووبەرووی وەشمگیر بوویەوە و شکستی خوارد و ڕێگەی تەبەرستانی گرتەبەر و نامەیەکی بۆ خەڵکانی عێراق نووسی و بۆ جیهاد هانیدان.

لەم ساڵەدا ئاڵ و گۆڕی ئەسیرەکان لەنێوان سەیف ئەلدەولە و ڕۆمییەکان ئەنجام درا و باوکی فوراس کوڕی حەمدان (وتاردەر و سەرداری ناودار و بوێر) کوڕە مامی سەیف ئەلدەولە و باوکی هەیسەم کوڕی قازی باوکی حەسین ڕزگاریان بوو.

لەشەوی شەممە سیانزەی شەعبان/ شەشی ئۆگۆستی ئەم ساڵە مانگ بەتەواوی گیرا.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عومەر کوڕی محەممەد کوڕی سالم ناسراو بە کوڕی جەعابی، حافزی بەغدادی کەشیعە بوو، مرد. باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی وەزاحی وەزاحی، وتادەری ئەنباری، کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پەنجا و شەشی کۆچی ( ٩٦٧ زایینی )

## چۆنیەتی مەرگی مۆعیز ئەلدەولە و فەرمانڕەوایەتی بەختیاری کوڕی

لەسیانزەی رەبیع الاخر/ بیست و نۆی مارسی ئەم ساڵە مۆعیز ئەلدەولە کە لەواست بوو بەهۆی نەخۆشی سك ئێشەوە مرد. ئەو سوپاکەی بۆ جەنگی عیمران کوڕی شاهین ئامادە کردبوو کەگرفتاری ئەم نەخۆشییە بوو و تەنگی پێ هەڵچنی. سوپاکەی خۆی لەوێ بەجێهێشت و ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و بەڵێنی گەڕانەوەی بەهاوەڵانیدا چوونکە هیوای بەباش بوونەوەی خۆی بوو. کاتێك گەیشتە بەغداد، نەخۆشیەکەی زیاتر ئازاریدا تا ئەو جێگەی گەدەی هیچی تیا نەما. کاتێك فریشتەی مەرگی لەسەر سەری خۆی بینی، عێزەد ئەلدەولە بەختیاری کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان و لەگوناحەکانی خۆی تەوبەی کرد و زۆربەی سامانەکەی لەڕێگەی خوادا بەخشی و هەموو کۆیلەکانی خۆی ئازاد و بەشێك لەسامانی هاوڕێکانی کەدەستی بەسەردا گرتبوو، بۆ خاوەنەکانی گەڕاندەوە و لەمانگی رەبیع الاخر، مرد. کاتێك مرد، لەباب ئەلتین لەگۆڕستانی قورەیش بەخاك سپێردرا. فەرمانڕەوایی ئەو بیست و یەك ساڵ و یانزە مانگ و دوو ڕۆژ درێژەی کێشا.

ئەو پیاوێکی خۆڕاگر، بەخشندە و بیرمەند بوو. کاتێك مۆعیز ئەلدەولە مرد و کوڕەکەی لەسەر تەختی باوك دانیشت، سێ شەو و ڕۆژ بێ وەستان باران باری تا ئەو جێگەی خەڵکان لەجموجۆڵ کەوتن. ئەو نوێنەری خۆی بۆ لای سەرکردەکان نارد و ڕەزامەندی ئەوانی بەدەست هێنا. ئاسمان هەوری پێوە نەما. بەم شێوەیە هەموان ڕازی و ئارام بوون و کەس دەرفەتی شۆڕشی دەستنەکەوت.

بەختیار نامەیەکی بۆ سوپا نووسی کەپەیمانی ئاشتی لەگەڵ عیمران کوڕی شاهین بەستبوو. سوپا گەڕایەوە. مۆعیز ئەلدەولە تەنیا یەك دەستی بوو. گێڕانەوەکان لەمبارەوە جیاوازن.

دەستەیەك دەیانوت لەکاتی جەنگ لەگەڵ کرمانییەکان – پێشتر ئاماژەمان

پێدا- دەستی لەجەستەی جیابۆتەوە، دەستەیەك ئاماژەیان بەگێڕانەوەی دیکە داوە. مۆعێز ئەلدەولە کاروباری خاوەن چوارپێکانی ڕێکخست و پارەیەکی زۆری پێدان چوونکە دەیویست هەواڵەکان بەخێرایی بەرۆکن ئەلدەولەی برای بگات. لەرۆژگاری ئەودا چەندین ڕاکەر و پەیکی تیژپێ دەرکەوتن کە لەپێش هەموو پەیکە تیژپێکانی دیکەوە بوون، یەکیان فەزڵ و ئەوی دیکەیان مەرعوش بوو. هەرکام لەوان رۆژانە چل و چەند فەرسەنگ ڕێگەی دەبڕی. یەك لەوان شیعە و ئەوی دیکەیان سوونی بوو. خەڵکان ئەوانیان بەکەسانێکی ڕاست کردار دەزانی. دوو دەستەی شیعە و سوونی هەرکام ئایینەکەی خۆیان پێش ئەوەی دیکە دەخست.

## بەد کرداری بەختیار و بەفیڕۆدرانی بارودۆخی ئەو

کاتێك مەرگی مۆعێز ئەلدەولە نزیك کەوتەوە، داوای لەبەختیاری کوڕی کرد، ملکەچی فەرمانەکانی رۆکن ئەلدەولەی مامی بێت و لەوەی ئەنجامی دەدات، ڕاوێژی پێ بکات و هەروەها گوێبیستی وتەکانی عێزەد ئەلدەولەی کوڕە مامی بێت چوونکە لەبەختیار گەورەتر و لەسیاسەت شارەزاتر بوو. هەروەها داوای لێکرد دوو دەبیرەکەی باوکی فەزڵ عەباس کوڕی حسەین و باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەباس لەپێگەکانی خۆیان بهێڵێتەوە چوونکە هەردووك کەسانێکی شیاو و ئەمانەتدار بوون. مۆعێز ئەلدەولە داوای لەکوڕەکەی کرد لەگەڵ دەیلەمییەکان، تورکەکان و سەبوکتەکین، بەشێوەیەکی چاکەکارانە هەڵس وکەوت بکات بەڵام بەختیار دژایەتی هەموو خواستەکانی باوکی کرد و سەرقاڵی شەهوەت و خۆشگوزەرانی بوو، قەشمەر و گۆرانیبێژەکان لەدەوری کۆبوونەوە و دوو دەبیرەکەی باوکی و سەبوکتەکینی لەخۆی دوورخستەوە و پەیوەندی نێوان ئەوان بەرەو کوژرانەوە رۆشت. سەبوکتەکین لێی جیابوویەوە و چیتر نەرۆشتە بارەگاکەی.

بەختیار لەبەر تەماح بۆ سەر زەوی و سامانی دەیلەمییەکان و کەسە نزیکەکانی ئەوان، لەشوێنەکانی خۆیان دووری خستنەوە. دەیلەمییە خاوەن پێگە نزمەکان

لەدەوری کۆبوونەوە و چاوی تەماحیان بڕییە دەسەڵات و دەسەڵات خوازی. تورکەکانیش ئەو کارەیان کرد. بەختیار لەبەر وشیاری ئەوەی دەیویست لەگەڵ سەبوکتەکین نەیکرد. تورکەکان لەگەڵ سەبوکتەکین هاوڕا بوون و دەیلەمییەکان بەرەو دەشت ڕۆشتنەدەر و داوایان لەبەختیار کرد ئەو کەسانە بگەڕێنێتەوە کەڕۆشتوون. بەختیار لەبەر تورە بوونی لەسەبوکتەکین بەخواستەکەی ئەوان رازی بوو. تورکەکانیش ئەو کارەیان کرد.

هەواڵی مەرگی مۆعیز ئەلدەولە بەدەبیرەکەی باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەباس گەیشت کەکاروبارەکانی عەممانی بەڕێوە دەبرد. ئەو کارەکانی بەنوێنەرەکانی عێزەد ئەلدەولە سپارد و بەرەو بەغداد بەرێکەوت.

باوکی فەرەج لەبەر ئەوە کاروبارەکانی بەعێزەد ئەلدەولە سپارد چوونکە کاتێک بەختیار جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست، باوکی فەزڵ بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان تەنیا بۆچوونەکانی خۆی بەکار دەبرد. باوکی فەرەج لەوە ترسا خۆ بەدوور گرتنی باوکی فەزڵ لێی درێژە بکێشێت و لەبەر ئەمە عەممانی بەعێزەد ئەلدەولە سپارد تا ناچار نەکرێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو سەرزەمینە لەوێ نیشتەجێ ببێت. ئەو ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر، بەڵام بەخواستەکەی خۆی نەگەیشت و باوکی فەزڵ کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد.

## هاتنەدەرەوەی سوپای خوراسان و مەرگی وەشمگیر

لەم ساڵەدا ئەمیر مەنسور کوڕی نوح، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهر، بەمەبەستی هێرش کردنە سەر ڕەی سوپای رازاندەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو کە - بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین- باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس لەکرمان بەرەو بوخارا بەرێکەوت و پەنای بۆ ئەمیر مەنسور برد. کاتێک گەیشتە دەرباری ئەو، ئەمیر ڕێزی گرت و پێگەی بەرز کردەوە. باوکی عەلی، تەماحی گرتنی سەرزەمینی مناڵەکانی بویەی خستە بەرچاوی ئەمیر و بۆ گرتنی ئەم سەرزەمینانە هانیدا و ئاگاداری کردەوە کارگوزارەکانی خێر و چاکەی ئەویان ناوێت و بەرتیل لەدەیلەمییەکان وەردەگرن.

ئـەم وتانـە لەگـەڵ ئـەوەی وەشمگـیر بەئـەمیری وتبـوو، یـەکیان دەگرتـەوە. ئـەمیر مەنـسور نامەیـەکی بـۆ وەشمگـیر و حەسـەن کـوڕی فیرزان نووسـی و ئـەو دوانـەی ئاگادار کردەوە کەمەبەستی گرتنی شاری ڕەی کردووە و فەرمانی پێدان سوپای خۆیان ئامادە و پەیوەستی سوپاکەی ئەو بن.

ئەمیر مەنسور سوپای رازانـدەوە و لەگـەڵ فەرماندەی سوپای خوارسان، باوکی حەسـەن محەممـەد کـوڕی ئیبراهیمـی سـیمجوری دەواتـی ڕەوانـەی کـرد و فـەرمانی فەرمانبـەری کـردن لـەوەشمگیر و هاورێیـەتی ئـەوی پێـدا و داوای لێکـرد بـەبێ فـەرمانی وەشمگـیر هـیچ کارێـك ئـەنجام نـەدات. ئـەوی وەك فەرمانـدەیی هـەموو سوپاییەکان دەستنیشان کرد.

کاتێـك ڕۆکـن ئەلدەولـە ئـەم هەواڵـەی پێگەیـشت، پەرێـشان و سـەرگەردان بـوو. چاوەڕوانی پێشهاتێکی گـەورەی دەکرد و زانـی هـەموو شـتێك کۆتـایی پێهاتووە، لەبەر ئەمە بنەماڵەکەی بۆ ئیسفەهان ڕەوانە کرد و نامەیـەکی بـۆ عێـزەد ئەلدەولـەی کوڕی نووسـی و داوای هاوکـاری لێکرد. هـەروەها نامەیـەکی بـۆ بەختیاری برازای نووسی و داوای هاوکاری لەویش کرد.

عێزەد ئەلدەولـە سـوپایەکی رازانـدەوە و بـەرەو خوراسـانی نـارد و وای نیشاندا مەبەسـتی خوراسـانی کـردووە چـوونکە ئـەو سـەرزەمینە سـوپای تیـا نـەماوە. خـەڵکانی خوراسـان ئاگـادار بوونـەوە و کـەمێك بـەرگرییان کـرد. سـوپای وەشمگیر ڕێگـەی خـۆی تـا دامغـان بـڕی و ڕۆکـن ئەلدەولـە و سـوپاکەی لـە شـارەی ڕەی بـۆ ڕووبـەڕووی ئـەوان بەڕێکـەوتن. لـەم کاتـەدا بەشـێوەیەکی لـەناکاو وەشمگـیر مـرد. چۆنیەتی مـەرگی ئـەو بـەم شـێوە بـوو: فـەرمانڕەوای خوراسـان چـەندین دیـاری بـۆ نـارد کەچـەند ئەسپێك لەناویاندا دەبینـرا. ئـەو بـەناو ئەسپەکاندا گـەڕا و یـەکیانی هەڵبژارد و سواری بوو. ویستی بڕواتە ڕاو. بەرازێکی برینـدار کـەڕمێك لەجەسـتەی چـەقیبوو، پـەلاماری وەشمگیریـدا و بەشـێوەیەکی چـاوەڕوان نـەکراو خـۆی کێـشا بەئەسـپەکەیدا. ئەسـپ جووتـەی خـست و وەشمگـیر کەوتـە ژێـرەوە و لەگوێـچکە و لووتیەوە خوێن فیچقەی دەکرد. جەنازەی بێ گیانی ئەویان هەڵگرت. ئەم پێشهاتە لەموحەرەمی ٣٥٧/ ٩٦٧ زاییـنی ڕوویـدا. بـەم شێوەیە شـۆڕش لـەناو ئەوانـدا بڵاو

بوویەوە و خواوەند ڕۆکن ئەلدەولەی لەدەستی ئەوان ڕزگار کرد.

کاتێك وەشمگیر مرد، بێستونی کوڕی جێگەی گرتەوە و نامەی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە نووسی و ڕێگەی ئاشتی گرتەبەر. ڕۆکن ئەلدەولە بەپارە و هێز هاوکاری کرد.

لەسەرسوڕهێنەرترین گێڕانەوەکان کەمرۆڤ بۆ ئەنجام کارە خواپەسەندانەکان و بەخشندەیی لەکاتی دەسەڵات و بەتوانا بوون هان دەدات ئەوەیە کاتێك سوپای خوراسان دەوری وەشمگیریان گرت، چەندین نامەی بۆ ڕۆکن ئەلدەولە نووسی و بەشێوەی جۆراوجۆر دەیترساند و دەینووسی ئەگەر تۆ بگرم، فلأنە بەلاّ و فیسارە بەلاّت بەسەر دێنم. وشەی ناشیرین و نەشیاوی بەکار دەبرد تا ئەو جێگەی دەبیرەکەی ڕۆکن ئەلدەولە نەیدەوێرا نووسراوەکانی وەشمگیری بۆ بخوێنێتەوە. ڕۆکن ئەلدەولە نامەی لەدەبیرەکەی وەرگرت و خوێندییەوە و وتی: لەگەڵ هەموو سوپاییەکان و بنەماڵەکەت، هەرگیز بەم ئەندازەیە لەبەر چاوی من ریسوا و پەست نەبوویت، بەڵام سەبارەت بەترساندنی تۆ، سوێند بەخوا ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنم، لەگەڵ تۆ جیاواز لەو شێوەی باست کرد، دەجووڵێمەوە (نەرمی لەگەڵ تۆ دەنوێنم) و ڕێزت دەگرم و پێگەت بەرز دەکەمەوە.

وەشمگیر بەدواهاتەکانی خراپەکاری خۆی گەیشت و ڕۆکن ئەلدەولە، وەڵامی چاکەکارییەکانی خۆی وەرگرت.

ڕۆکن ئەلدەولە لەتەبەرستان دوژمنێکی بوو بەناوی نوح کوڕی نەسر. ئەو ڕق و کینەی ڕۆکن ئەلدەولەی لەدڵدا پەروەردە دەکرد و هێرشی دەکردە سەر سنوورەکانی ڕۆکن ئەلدەولە. لەم کاتەدا ئەویش مرد و لەهەمەدان پیاوێکی دیکە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە بەناوی ئەحمەد کوڕی هارونی هەمەدانی. ئەحمەد کاتێك لەهەواڵی هێرشی خەڵکانی خوراسان ئاگادار بوویەوە، شۆڕشی کرد بەڵام کاتێك لەمەرگی وەشمگیر ئاگادار بوویەوە، دەستبەجێ مردو خواوەند بەلاّی ئەوی لەسەر ڕۆکن ئەلدەولە نەهێشت.

## قۆڵبەست کرانی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان

لەم ساڵەدا باوکی تەغلەب کوڕی ناسر ئەلدەولە، باوکی خۆی (ناسر ئەلدەولە) گرت و لەقەڵاکەیدا زیندانی کرد. ئەم پێشهاتە لەشەوی شەممە، بیست و چواری جومادی الاوەل/ هەشتی مەی روویدا.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: باوکی ئەو پیر و تورە ببوو، بارودۆخی لەمناڵ و کەسەکانی دژوار دەکرد و لەخێرخوازییەکانیان ڕێگەی ناسازگاری دەگرتەبەر و لەبەر ئەمە هەموان لێی بێزار بوون.

یەکێك لەناسازگارییەکان ئەوە بوو کاتێك مۆعیز ئەلدەولە مرد، مناڵەکانی ناسر ئەلدەولە مەبەستی عێراقییان کرد تا بەختیار دەرپەڕێنن. ناسر ئەلدەولە ڕێگەی ئەم کارەی لێگرتن و وتی: مۆعیز ئەلدەولە سامانێکی زۆری لەدوای خۆی بەجێهێشتووە و کوڕەکەی بۆ جەنگی ئێوە بەکاری دەبات، خۆڕاگر بن تا ئەو کاتەی سامانەکانی خۆی پرژ و بلاو دەکاتەوە و دواتر هێرشی بکەنەسەر و لەم جەنگەدا لەرژدی و چاوچنۆکی خۆتان بەدوور بگرن چوونکە بەدڵنیاییەوە سەرکەوتن بەدەست دێنن. دوای ئەم وتەیە باوکی تەغلەب هێرشی کردەسەر و قۆلبەستی کرد و بردییە قەلاکەی و کەسێکی راسپارد تا خزمەت و نیازەکانی بۆ دابین بکات.

کاتێك باوکی تەغلەب، باوکی گرت، ژمارەیەك لەبراکانی ڕێگەی ناسازگارییان گرتەبەر و یەکبوونی ئەوان پەرتەوازە بوو. مەبەستی کۆتاییان ئەوە بوو پارێزگاری لەسامانەکانی خۆیان بکەن. سەرەنجام باوکی تەغلەب بەئاشتی و بەستنەوەی پەیمانی دووبارە لەگەڵ بەختیار ناچار کرا تا بەم شێوەیە بیانو و پاساو بەبڕا و نەیارەکانی نەدات. بەختیار پەیمانی ئەوی بەوەرگرتنی هەزار هەزار و دووسەد هەزار درهەم لەساڵدا تازە کردەوە.

## فەرمانڕەوا مردووەکان لەم ساڵەدا

وەك ئاماژەی پێدرا وەشمگیر کوڕی زیاد و مۆعیز ئەلدەولە و حەسەن کوڕی فیرزان و کافوری ئەخشیدی و نەقفور، پاشای رۆم، و باوکی عەلی محەممەد کوڕی

ئەلیاس، فەرمانڕەوای کرمان، سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان هەموویان لەم ساڵەدا مردن.

سەیف ئەلدەولە باوکی حەسەن عەلی کوڕی باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان کوڕی حەمدونی تەغلەبی ڕەبعی لەمانگی سەفەر لەحەلەب مرد. جەنازەی ئەویان بردە مەیافارقین و لەوێ بەخاکیان سپارد. لاوازی ئەندامەکانی بووە هۆی مەرگی ئەو. دەستەیەك مەرگی ئەو بەهۆی گمیز نەکردنەوە دەزانن (چوونکە گمیزی بۆ نەدەکرا). ئەو لەزیحەججەی ٣٠٣/ جونی ٩١٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. پیاوێکی بەخشندە و جوامێر بوو. چەندین هۆنراوەیشی لێ بەجێ ماوە. یەکێك لەهۆنراوەکانی سەبارەت بەناسر ئەلدەولەی برای ئەمەیە:

و هبت لك العليا و قد كنت اهلها    و قلت لهم بينى و بين اخى فرق

و ما كان بى عنها نكول و انما    تجاوزت عن حقى فتم لك الحق

اما كنت ترضى ان اكون مصليا    اذا كنت ارضى ان يكون لك السبق

واتاکەی: من گەورەیی و ڕێزداریم بەتۆ سپارد و تۆ شیاوی بۆی. من پێم وتن: لەنێوان من و براکەم هاوتایی نابینرێت. من پشت لەم ڕاستییە ناکەم و تەنیا چاوپۆشیم لەماق خۆم کرد تا ئەم مافە بەتەواوی بۆ تۆ دەستەبەر بێت. ئایا ئەگەر من شادمانم کەتۆ ئیمام و پێشنوێژ بیت، تۆ شادمان نیت من لەناو ڕیزی نوێژکەراندا بم.

ئەمەیش هۆنراوەی ئەوە:

قد جرى فى دمعه دمه    فالى كم انت تظلمه

رد عنه الطرف منك فقد    جرحته منك اسهمه

كيف يستطيع التجلد من    خطرات الوهم تؤلمه

واتاکەی: خوێنی ئەو لەگەڵ فرمێسك ڕەوان بووە، تاکەی ستەمی لێ دەکەیت. تیری ڕوانینی خۆت لەسەر ئەو هەڵگرە، چوونکە تیری نیگای تۆ، بریندداری دەکات. چۆن کەسێك کەمەترسییەکانی گومان و خەیاڵ دەیڕەنجێنێت، توانای خۆڕاگری هەیە.

کاتێك سەیف ئەلدەولە مرد، کوڕەکەی باوکی مەعلی شەریف جێگەی گرتەوە.

داستانی مەرگی باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس لەساڵی ٩٦٨/٣٥٧ زایینی ئاماژەی پێدەدرێت.

کافور کەفەرمانڕەوای میسر بوو، لەموالییەکانی ئەخشید محەممەد کوڕی توغج، دوای مەرگی ئەخشید، لەبەر کەم تەمەنی مناڵەکانی ئەو، بەسەر میسردا زاڵ بوو. ئەو خواجە (ئەگەری هەیە بەمانای گەورە یا خەساو بێت) و ڕەشپێست بوو. موتەنەبی سەبارەت بەهۆنراوەی وەسف کردن و سەرکۆنە کردنی هەیە. بۆ بینینی ئەو مەبەستی ڕۆشتن بۆ حیمسی کرد و بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ کافور بەناوبانگە. کاتێك کافور مرد، ئەم هۆنراوەیان لەسەر گۆڕەکەی نووسی:

انظر الی غیر الایام ما صنعت      افنت اناسا بها کانوا و قد فنیت

دنیاهم ضحکت ایم دولتهم      حتی اذا انقرضوا ناحت لهم و بکث

واتاکەی: بڕوانە بزانە گۆڕانەکانی ڕۆژگار چی کردووە؟ ئەو خەڵکەی لەناویاندا ژیاوە، لەناوی بردووە و خۆیشی لەناو چووە. جیهان بۆ ئەوان لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی پێکەنی و کاتێك ئەوان مردن، بۆ ئەوان گریا و شینی گێڕا.

لەم ساڵەدا باوکی فەرەج عەلی کوڕی حسەین کوڕی ئەحمەدی ئیسفەهانی ئومەوی لەوەچەکانی محەممەد کوڕی مەروان کوڕی حەکەمی ئومەوی، مرد. ئەو شیعە بوو کەئەمە یەکێکە لەبابەتە سەرەنج ڕاکێشەکان.

کتێبی (اغانی) و چەندین کتێبی دیکەی نووسیوە.

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی عومەر کوڕی باوکی عومەری قازی، مرد. ئەو لەساڵی ٩١٧/٣٠٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو لەڕۆژگاری باوکی وەك قازی بەغداد دەستنیشان کرا و دوای مردنی باوکی، لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی سالیم، هاوڕێی سەهلی توستەری (شووشتەری) کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پەنجا و حەوتی کۆچی ( ٩٦٨ زایینی )

### شۆڕشی حەبەشی کوڕی مۆعیز ئەلدەولە دژی بەختیار لەبەسرە و گرفتار بوونی

لەم ساڵەدا حەبەشی کوڕی مۆعیز ئەلدەولە دژی بەختیاری برای ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەو لەکاتی مەرگی باوکی فەرمانڕەوای بەسرە بوو. کەسانی دەوروبەر هانیاندا تا سەربەخۆ فەرمانڕەوایەتی بەسرە بکات و پێیان وت براکەی بەختیار، توانای هێرش کردنە سەر ئەوی نییە. ئەو یاخیبونی خۆی دەستپێکرد و براکەی ئاگادار بوویەوە. بەختیار، وەزیرەکەی، باوکی فەزڵ عەباس کوڕی حسەینی ڕەوانە کرد تا بەهەر شێوەیەك دەتوانێت حەبەشی برای بگرێت. وەزیر وای نیشاندا دەیەوێت بڕواتە ئەهواز. کاتێك گەیشتە واست، لەوێ مایەوە تا کاروباری ئەو دیارە سامان بدات. نامەیەکی بۆ حەبەشی نووسی کەڕێگەی سازگاری لەگەڵ دەگرێتەبەر و فەرمانڕەوایەتی بەسرەی پێدەسپێرێت و هەروەها نووسی لەبەر وەزارەت بڕە پارەیەك قەرزارم و دەبێت هاوکاریم بکەیت. حەبەشی دووسەد هەزار درهەمی بۆ نارد و دڵنیا بوو لەوەی فەرمانڕەوایەتی بەسرە لەدەستی خۆیدایە. وەزیر پەیکی بۆ لای سوپای ئەهواز نارد تا هەمان ڕۆژ هێرش بکەنە سەر ئوبولە و خۆی لەواستەوە ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر و لەگەڵ سوپاییەکانی ئەهواز لەیەك ڕۆژدا گەیشتنە ئەو شارە. حەبەشی نەیتوانی بارودۆخی خۆی ڕێکبخات و نیازەکانی دابین بکات. ئەویان گرت و لەرامهورموز زیندانییان کرد.

مامی، ڕۆکن ئەلدەولە، کەسانێکی نارد و لەزیندان هێنایەدەر. ئەو ڕۆشتە لای عێزەد ئەلدەولە. عێزەد ئەلدەولە، زەوییەکی فراوانی خستە بەردەستی حەبەشی. حەبەشی لای ئەو مایەوە تا لەساڵی ٩٧٩/٣٦٩ زایینی مرد. وەزیر سامانە فراوانەکانی ئەوی لەبەسرە زەوت کرد. لەو شتانەی دەستی بەسەردا گرت پانزە هەزار بەرگ کتێب بوو.

## بەیعەتی محەممەد کوڕی موستەکفی (بۆ خەلافەت)

لەم ساڵەدا لەناو هەموو چین و توێژەکانی بەغداد، بانگەوازی پیاوێك بەگوێ گەیشت بەناوی محەممەد کوڕی عەبدوللە. دەوترا ئەو یەکێك لەبنەماڵەی پێغەمبەرە و هەروەها دەوترا لەبنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) نییە و دەجالێکە پێشتر پێغەمبەر(د.خ) ئامارەی بەهاتنی داوە. ئەو خەڵکی بۆ چاکە هان دەدا و رێگەی خراپەی لێدەگرتن، ئەوەی لەدین پشت گوێ خرابوو، زیندووی دەکردەوە و بەکاری دەبرد. بەسوننییەکان دەوترا ئەو عەباسییە و بەشیعەکان دەوترا، عەلەوییە. بانگەشەکەرانی ئەو فراوان و بەیعتیان بۆ وەرگرت.

ئەو لەمیسر بوو، کافوری ئەخشیدی رێزی دەگرت و چاکەی لەگەڵ دەکرد. لەو کەسانەی دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد، یەکیان سەبوکتەکینی عەجەمی بوو (جیاوازە لەسەبوکتەکین باوکی مەحمود یا سەبوکتەکینی پەردەدار) کەیەکێك لەسەرکردە گەورەکانی مۆعێز ئەلدەولە لەقەڵەم دەدرا. سەبوکتەکین شیعە و ئەم پیاوەی بەعەلەوی دەزانی. سەبوکتەکین ئەوی لەمیسرەوە بۆ لای خۆی بانگ کرد. ئەو بەرەو ئەنبار بەرێکەوت و سەبوکتەکین لەرێگەی فوراتەوە پێشوازی لێکرد و پشتیوانی کردنی خستە ئەستۆی خۆی. سەبوکتەکین محەممەد کوڕی موستەکفی یا هەمان محەممەد کوڕی عەبدوللەی بینی و بەخزمەت کردنی هەستا و بێ ئەوەی گومانی لێ بکات، ئەوی بردە بەغداد.

دواتر بۆ سەبوکتەکین ئاشکرا بوو ئەم پیاوە منداڵی موستەکفی (خەلیفەی پێشوو) عەباسییە، لەبەر ئەمە لەمەبەست و باوەڕەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە. منداڵی موستەکفی (یا هەمان محەممەد کوڕی عەبدوللە) ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ هاوەڵانی ترسان و هەڵاتن و بڵاوەیان لێکرد. دوای ماوەیەك خۆی و براکەیان گرت و بردیانە لای بەختیار. بەختیار ئەمانی پێبەخشین بەڵام خەلیفە موتیع ئەوانی لەبەختیار وەرگرت و لووتی بڕی و چیتر ناوی نەهاتە سەرزمان و لەناوچوو.

## زاڵبوونی عێزەد ئەلدەولە لەکرمان

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە بەسەر کرمان زاڵبوو.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوەیە: عەلی کوڕی ئەلیاس – وەك ئاماژەی پێدرا– بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ فەرمانڕەوایەتی ئەم دیارەی دەکرد. دواتر بەشێوەیەك گرفتاری لاوازی جەستە بوو کە لەمەرگی خۆی ترسا. ئەو مناڵە گەورەکەی، ئەلیەسع، ئەلیاس و سلێمانی کۆکردەوە و داوای بەخشینی لەئەلیەسع کرد چوونکە لەباوکی ڕەنجا بوو. ئەوی وەك جێگری خۆی بۆ فەرمانڕەوایەتی دەستنیشان کرد و ئەلیاسی کردە جێگری ئەو. فەرمانی بەسلێماندا بۆ سەرزەمینەکەی خۆی (سوغد) بگەڕێتەوە و فەرمانیدا سامانەکانی ئەو لەو سەرزەمینە کۆبکاتەوە. ئەو دەیویست سنوری ئەلیەسع لەسنوری سلێمان بەدوور بێت (چوونکە دوژمنی یەکتر بوون) بەلأم سلێمان کاتێك باوکی بەجێهێشت دەستی بەسەر سیرجاندا گرت و کاتێك باوکی لەکارەکەی ئاگادار بوویەوە، ئەلیەسعی لەگەڵ سوپایەك بۆ سەرکوت کردنی ئەو نارد و فەرمانی پێدا دژی سلێمان بجەنگێت و لەسیرجان دووری بکاتەوە. هەروەها فەرمانی پێدا ئەگەر سلێمان مەبەستی ڕۆشتن بۆ سوغدی کرد، ڕێگەی لێ بگرێت. ئەلیەسع بۆ جەنگی سلێمان بەرێکەوت و ناکاوگیر و سەرکوتی کرد. کاتێك سلێمان ئەم بارودۆخەی بینی، سامانەکانی کۆکردەوە و ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر. ئەلیەسع کاروباری سیرجانی گرتەدەست و فەرمانی تالأن کردنیدا و سیرجان تالأن کرا. قازی و دەستەیەك لەگەورەکانی شار داوای ئەمان و بەخشینیان کرد و ئەو لێیان خۆش بوو.

دەستەیەك لەهاوەڵانی باوکی لێی دەترسان و لای باوکی خراپەی ئەویان هێنایە سەرزمان. باوکی ئەوی گرت و زیندانی کرد. لەم کاتەدا دایکی ئەلیەسع ڕۆشتە لای دایکی ئەلیاس و پێی وت: هاوسەرەکەمان، ئەو پەیمانەی بەکوڕەکەمیدا بوو، شکاندی و دواتر ئەو بەلأیش بەسەر کوڕەکەی تۆ دێنێت و بەم شێوەیە فەرمانڕەوایەتی لەدەست ئەلیاس دەردەچێت، باشترە بۆ ئازاد کردنی کوڕەکەم هاوکاریم بکەیت تا بارودۆخ بۆ دۆخی جاران بگەڕێتەوە.

باوکی ئەلیەسع هەندێ کات بێهۆش دەبوو و بێهۆشییەکەی درێژەی دەکێشا و

هەستی بەهیچ نەدەکرد. ئەم دوو ژنە و دەستەیەک لەکەنیزەکان لەکاتی بێ هۆشی باوکی ئەلیەسع، ئەویان لەزینـدان هێنایـەدەر. ئـەو زنجیرەکـەی خـۆی پـچڕاند و مەبەستی سوپای کرد. سەربازەکان لەبینینی شادمان بوون و گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا. ئەوانەی تۆمەتیان بۆ هەڵبەستبوو، هەڵاتن. ئەلیەسع ژمارەیەک لەوانی گرت و ئەوانی دیکە ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. ئەلیەسع ڕووی کردە قەڵاکە تا گەمارۆی بخاتەسەر.

کاتێك باوکی هاتە هۆش و لەبارودۆخ ئاگادار بوویەوە، نامەیەکی بۆ ئەلیەسع نووسی و داوای لێکرد دەستی لێ هەڵگرێت و ئەمان بەخۆی وکەسەکانی بدات تا ئەویش سنورەکانی کرمانی پێبسپێرێت و خۆی بەرەو خوراسان بەرێکەوێت و لەو دیارە یەکێك بێت لەکەسەکانی ئەو. ئەلیەسع ڕازی بوو. باوك قەڵا و سامانێکی زۆری بەکوڕەکەی سپارد و ئەوەی دەیویست، هەڵیگرت و ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و مەبەستی بوخارای کرد. ئەمیر مەنسور کوڕی نوح ڕێزی گرت و باوکی عەلی کوڕی ئەلیاسی لەخۆی نزیك کردەوە. باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس، مەنسوری بۆ هێرش کردنە سەر ڕەی و سەرکوت کردنی بنەماڵەی بویە -وەك ئاماژەمان پێدا- هاندا و لای ئەو مایەوە تا ئەوەی سەرەئەنجام بەهۆی لاوازی ئەندامەکانی لەساڵی ٩٦٧/٣٥٦ زایینی مرد.

سلێمانی کوڕی لەبوخارا بوو، بەڵام یەسع حەزی بەفەرمانڕەوایەتی کرمان دەکرد و سەرکێشی هەڕەتی لاوی تامەزرۆیی بۆ زاڵ بوون بەسەر عێزەد ئەلدەولە، ئەوی بۆ هێرش کردنە سەر بەشێك لەکەنارەکانی سەرزەمینی عێزەد ئەلدەولە هاندا چوونکە ژمارەیەك لەهاوەڵانی عێزەد ئەلدەولە پەیوەستی بوون و ئەو چاکەی لەگەڵ کردن بەڵام ژمارەیەك لەم دەستە بۆ لای عێزەد ئەلدەولە گەڕانەوە و ئەلیەسع گومانی لەوانی دیکە کرد و سزای دان و جەستەی ئەوانی کوت کوت (لەت لەت) کرد.

لەم کاتەدا دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەلیەسع داوای ئەمانیان لەعێزەد ئەلدەولە کرد وعێزەد ئەلدەولە چاکەی لەگەڵ کردن و خەڵاتی پێبەخشین. کاتێك هاوەڵانی جیاوازی کردەوەکانی ئەوانیان بینی، کەم کەم لێی جیابوونەوە و پەیوەستی

سوپای عێزەد ئەلدەولە بوون. جارێکیان هەزار کەس لەگەورە پیاوانی هاورێی ئەو پەیوەستی عێزەد ئەلدەولە بوون وئەلیەسع مایەوە و ژمارەیەك لەکەسە تایبەتییەکانی. زۆربەی سوپاکەی بەتەنیا جێیان هێشت.

ئەلیەسع کاتێك ئەم بارودۆخەی بینی، سامان و بنەماڵەکەی هەڵگرت و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بەرەو بوخارا بەرێکەوت. عێزەد ئەلدەولە بەرەو کرمان بەرێکەوت و ئەو دیارەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و دەستی بەسەر سامانی ئەلیەسع و بنەماڵەکەی گرت. ئەم پێشهاتە لەمانگی رەمەزان/ جولای روویدا. عێزەد ئەلدەولە ئەو ویلایەتی بەکوڕەکەی، باوکی فوراس سپارد. باوکی فوارس ئەو کەسەیە نازناوی شەرف ئەلدەولەی پێبڕا و عێراقی خستە ژێر فەرمانی خۆی. عێزەد ئەلدەولە، کورتکین کوڕی جوستانی وەك نوێنەری خۆی لەوێ بەجێهێشت و بۆ فارس گەڕایەوە. ئەمیری سیستان نامەی بۆ نووسی و بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە. ئەمە یەکێك لەهۆکارەکانی سست بوون و لاوازی ساسانییەکان بوو کەچاوی تەماحیان تێبڕی.

کاتێك ئەلیەسع گەیشتە بوخارا، ئەمیری ئەو دیارە رێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد بەڵام ئەو سامانییەکانی لەبەر کەمتەرخەمی بۆ هاوکاری کردنی یەکتر وگەڕانەوەیان بۆ فەرمانڕەوایی، سەرکۆنە کرد. لەبەر ئەمە لەبوخاراوە بۆ خوارەزم ڕەوانە کرا.

هەواڵەکانی ئەو بەعەلی کوڕی سیمجور گەیشت. ئەو مەبەستی سامانەکانی ئەلیەسعی کرد چوونکە ئەلیەسع ئەم سامانەی لەکەنارەکانی خوراسان بەجێهێشتبوو. عەلی کوڕی سیمجور هەموو سامانەکانی فراند و دارایی و هەموو شتێکی ئەلیەسعی تالان کرد. ئەلیەسع لەخوارەزم گرفتاری ئازاری چاو بوویەوە و بەرادەیەك پەرێشانی کرد کە لەتاو ئازاری چاو، ناچار بوو بەدەستی خۆی ئەو چاوەی ئازار بوو، دەربێنێت و ئەمە بووە هۆی مەرگی ئەو و چیتر بنەماڵەی ئەلیاس لەکرمان فەرمانڕەوایەتییان نەکرد. ئەوەی ئەلیەسع گرفتاری بوو لەدۆعا و نفرینەکانی باوکی سەرچاوەی گرت.

## کوژرانی باوکی فوراس کوڕی حەمدان

لەرەبیع الاخر/ مارسی ئەم ساڵە باوکی فوراس کوڕی باوکی ئەعلا سەعید کوڕی حەمدان کوژرا.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك ئەو لەحیمس مابوویەوە، لەنێوان ئەو و باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان ئاژاوە کەوتەوە. باوکی ئەلمەعالی ئەوی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد و باوکی فوراس بۆ دیاری سەدەد پەنای برد. سەدەد گوندێك لەدەشتی حیمس بوو. باوکی ئەلمەعالی لەعەرەبەکان، مناڵەکانی کەلاب و کەسانی دیکەی کۆکردەوە و ئەوانی بەفەرماندەیی قەرغویە بەشوێن باوکی فوراس ڕەوانە کرد. قەرغویە لەسەدەد ئەوی گرت. هاوەڵانی باوکی فوراس داوای ئەمانیان کرد و باوکی فوراس تێکەڵ بەئەمان بەخشراوەکان بوو. قەرغویە ئەوی ناسییەوە و فەرمانی بەکۆیلەکەیدا بیکوژێت. کۆیلە، باوکی فوراسی کوشت و سەری لەجەستەی جیا کردەوە و جەنازەکەی لەدەشت بەجێهێشت. دواتر عەرەبێك بەخاکی سپارد.

باوکی فوراس خاڵی باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە بوو. چەند راستە وتەی ئەو شاعیرەی وتوویەتی: پاشایەتی نەزۆکە. (باوکی فوراس گەورەترین و باشترین ئەمیر و شاعیر و خۆبەخش لەجیهانی شیعەکاندا بوو. بەلایەنگری کردن و شوێنکەوتنی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناوی دەرکردبوو. چەندین هۆنراوەی لێ بەجێماوە بۆ وەسف کردنی بنەماڵەی عەلی و گەورەیی ئەوان بەبەراوەرد لەگەڵ مناڵەکانی عەباس.))

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەنیوەی شەعبان/ شانزەی جولای ئەم ساڵە موتەقی باللە ئیبراهیم کوڕی موقتەدر لەماڵەکەی خۆی (دەستبەسەر کرابوو) مرد و لەوێ بەخاك سپێردرا.

لەزیقەعدە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە ژمارەیەکی بەرچاو لەسوپای ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر ئەنتاکییە و لەکەنارەکانی ئەو سەرزەمینە کوشتار و تالآنییان کردە پیشە. دوانزە هەزار ژن و پیاوی موسوڵمانیان ئەسیر کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا لەنێوان هەبەی راغعی و ئەسەد کوڕی وەزیری غوبری جەنگ ڕوویدا. ئەسەد داوای سوپای لەخزری یەشکری کرد. خزر، لەشوێنکەوتەکانی عیمران کوڕی شاهین ئەمیر بەتائیح بوو، هاوکاری کرد و ڕووبەڕووی هەبە بوویەوە. ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی هەبەی کوشت و شکستی پێهێنا و دەستی بەسەر جونبولا و قەسین لەسەرزەمینی عێراق گرت. سەبوکتەکینی عەجەمی هێرشی کردە سەر خزر و بارودۆخی لێ دژوار کرد. خزر بەناچاری بۆ بەسرە هەڵات و داوای ئەمانی لەباوکی فەزڵی وەزیر کرد.

لەم ساڵەدا خەڵکانی بەغداد لەڕۆژی عاشورا و غەدیری خوم ئەوەیان کرد کەپێشتر ئەنجامیان دەدا. لەعاشورا پرسەیان گێڕا و گریان و غەدیری خومیان کردە جەژن.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی بندار کوڕی حسەین باوکی حەسەنی سۆفی ناسراو بە سەیرەفی نەیشابوری مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پەنجا و هەشتی کۆچی( ٩٦٩ زایینی )

### فەرمانڕەوای مۆعیزی عەلەوی لەمیسر

لەم ساڵەدا مۆعیزلدین الله باوکی تەمیم مەعد کوڕی ئیسماعیل مەنسور بالله، کۆیلە و سەرکردەی باوکی خۆی، حەسەنی جەوهەری (ڕۆمی بوو) لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ میسر ڕەوانە کرد. حەسەن دەستی بەسەر ئەو دیارەدا گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك کافوری ئەخشیدی، فەرمانڕەوای میسر مرد، خەڵکان گرفتاری چەند بەرەکی بوون و گرانی هاتە ئاراوە تا ئەو جێگەی یەك ڕەتڵ نان بەدوو درهەم دەکڕدرا و دەفرۆشرا و نرخی یەك پێوانە گەنم، بۆ یەك دینار و یەك شەشی دیناری میسری بەرز بوویەوە. کاتێك مۆعیز لەئەفریقییە لەم بارودۆخە ئاگادار بوویەوە، جەوهەری بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. کاتێك سوپای ئەخشیدی لەهاتنی جەوهەر ئاگادار بوونەوە، پێش هاتنی ئەو ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر.

جەوهەر لەحەڤدەی شەعبان/ هەشتی جولای گەیشتە ئەو سەرزەمینە و لەمزگەوتی عەتیق بەناوی مۆعیز وتاری خوێندەوە. وتارخوێن، باوکی محەممەد عەبدولله کوڕی حسەینی شمشاتی بوو.

لەجومادی الاوەلی ٣٥٩/ مارسی ٩٧٠ زایینی جەوهەر ڕۆشتە مزگەوتی کوڕی تولون و فەرمانی بەبانگبێژدا (حی علی خیر العمل) بڵێت. هەروەها لەمزگەوتی عەتیقیش ئەو کارەی دووبارە کردەوە و بەدەنگی بەرز (بسم الله الرحمان الرحیم)ی هێنایەر سەرزمان. کاتێك جەوهەر لەمیسر جێگیر بوو، دروست کردنی شاری قاهیرەی دەست پێکرد.

### زاڵبوونی مۆعیزی عەلەوی لەدیمەشق و شارەکانی دیکەی شام

کاتێك جەوهەر لەمیسر نیشتەجێ و جێ پێی خۆش کرد، جەعفەر کوڕی فەلاحی کەتامی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ شام ڕەوانە کرد. کاتێك کەتامی گەیشتە ڕەملە کەلەژێر فەرمانی باوکی محەممەد حەسەن کوڕی عەبدولله کوڕی

توغجدا بوو، لەزیحەججە/ ئۆکتۆبەری ئەو ساڵە جەنگ دەست پێکرد. لەنێوان دوو سوپا چەندین جەنگ روویدا و سەرئەنجام جەعفەر کوڕی فەلاح سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کوڕی توغج و سەرکردەکانی ئەسیر کران. کەتامی ئەوانی بۆ لای جەوهەر نارد و جەوهەریش بۆ لای مۆعیز لەئەفریقییە ڕەوانەی کردن. کوڕی فەلاح ئەو سنورەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و ژمارەیەکی زۆر لەپیاوانی کوشت و ئەمانی بەپاشماوەی خەڵکان بەخشی و باجی کۆکردەوە و ڕێگەی تەبەرییەی گرتەبەر. لەوێ کوڕی مەڵهەمی بینی کەپێشنیاری بەیعەت کردنی خەڵکانی لەگەڵ مۆعێزلەدین دەکرد. کوڕی فەلاح رووی کردە دیمەشق و رووبەرووی دانیشتووانەکەی بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و فەرمانڕەوایی شارەکەی گرتەدەست و بەشێکی تالآن کرد بەلآم بەشەکانی دیکەی وەك خۆی هێشتەوە و لەرۆژی هەینی، چەند رۆژی سەرەتایی موحەرەمی ٣٥٩/ نۆڤەمبەری ٩٦٩ زایینی وتاری بەناوی مۆعێزی عەلەوی خوێندەوە و چیتر وتاریان بەناوی منالەکانی عەباس نەدەخوێندەوە.

شەریف باوکی قاسم کوڕی باوکی یەعلی هاشمی کەپیاوێکی رێزدار و وتەکانی لەناو خەڵکدا کاریگەر بوو، گەنج و شۆڕشگێرانی شارەکەی کۆکردەوە و لەهەینی دووەم دژی سوپاکەی فەلاح ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە و نەیهێشت چیتر وتار بەناوی مۆعێزی عەلەوی بخوێندرێتەوە و دووبارە ناوی موتیع یان لەوتارەکاندا هێنایەوە و جل و بەرگی ڕەشی پۆشی (کەدروشمی عەباسییەکان بوو) و بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە. جەعفەر کوڕی فەلاح رووبەرووی خۆی و هاوەڵانی بوویەوە بەلآم خەڵکانی دیمەشق خۆڕاگرییان نیشاندا و لەکۆتایی رۆژ دەستیان لەجەنگ هەڵگرت و بەیانی ئەو رۆژە دووبارە هەردوولا ریزیان بەست و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و لەهەردوولا ژمارەیەکی زۆر کوژران. شەڕ بەردەوام و سوپای دیمەشق تێکشکاو دەگەڕایەوە، شەریف کوڕی باوکی یەعلی لای دەروازەکە وەستابوو و دیمەشقییەکانی بۆ جەنگ هاندەدا و ورە و خۆڕاگری ئەوانی بەرز دەکردەوە.

مەغربییەکان لەهێرش کردنە سەر خەڵکانی دیمەشق بەردەوام بوون تا ئەوەی

تا کەنار دەروازەکان پاشەکشێیان پێکردن. مەغریبییەکان گەیشتنە لای کۆشکی حەجاج و ئەوەی دەستیان کەوت، تالآنیان کرد. کاتێک کوڕی باوکی یەعلی هاشمی ئەم بارودۆخەی بینی و گەنجەکانی دیمەشق ڕووبەڕووی شکست بوونەوە، شەوانە لەشارەکە ڕۆشتنەدەر و خەڵکی شارەکە سەرگەردان مانەوە. شەریف بەناچاری پەنای بۆ جەعفەر برد. جەعفەر کوڕی فەلاح ئەمانی پێبەخشی وفەرمانی پێدان خەڵکان هێمن وئارام بکاتەوە و بەڵێنی چاکەی پێدان. شەریف ئەو کارەی کرد و فەرمانی بەخەڵکان و سەربازەکاندا بۆماڵەکانی خۆیان بگەڕێنەوە و نەیێنەدەر تا جەعفەر کوڕی فەلاح کە لەدەرەوەی شارەکە بوو، بێتە ناو شارەکە و بۆ ئوردووگاکەی بگەڕێتەوە. ئەو کارەیان کرد.

کاتێک مەغریبییەکان هاتنە ناو شارەکە، خراپەکارییان دەست پێکرد و یەکێک لەگەرەکانی شاریان تالآن کرد. خەڵکان دووبارە شۆڕشیان کردەوە و هێرشیان کردە سەریان و دەستیان بۆ شمشێر برد و ژمارەیەک لەمەغریبییەکانیان کوشت و شارەکەیان سەنگەربەندی کرد و خەندەکیان هەڵکەند و بڕیاری جەنگ و بەرگری کردن لەشارەکەیاندا. مەغریبییەکان دەستیان لێ هەڵگرتن. خەڵکان ڕۆشتنە لای شەریف باوکی قاسم کوڕی باوکی یەعلی و داوایان لێکرد هەوڵ بدات بارودۆخ سەقامگیر بکات. شەریف ئەو کارەی کرد و کاروبارەکانی بەشێوەیەک بەڕێوە برد کە تا ڕۆژی پێنجشەممە، شانزەی زیحەججەی ٣٥٩/ بیست و یەکی ئۆکتۆبەری ٩٧٠ زایینی، ئارامی باڵی بەسەر شارەکەدا کێشا. لەکاتی جەنگ، ژمارەیەکی زۆر لەماڵەکان سووتان.

فەرماندەی پاسەوانەکان لەڕۆژی هەینی ڕۆشتە لای جەعفەر کوڕی فەلاح و نوێژی لەگەڵ خەڵکان خوێند و ئەوانی ئارام و دڵخۆش کرد و لەموحەڕەمی ٣٦٠/ نۆڤەمبەری ٩٧٠ زایینی ژمارەیەک لەگەنجەکان و شەریف باوکی قاسم کوڕی باوکی یەعلی گرت و ڕەوانەی میسری کردن و بەم شێوەیە شارەکە ئارامی بەخۆوە بینی. شیاوتر بوو هەواڵی سەرکەوتنی جەعفەر کوڕی فەلاح لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٣٦٠/٩٧٠ زایینی باس بکەین بەڵام لێرەدا ئاماژەمان پێدا تا گێڕانەوەکان سەبارەت بەوان پچڕانی تێ نەکەوێت.

## ناسازگاری مناڵەکانی ناسر ئەلدەولە لەگەڵ یەك و مەرگی باوکیان

هۆکاری ناسازگاری مناڵەکانی ناسر ئەلدەولە ئەمە بوو: ئەو شاری رەحبە و ماردین و شارەکانی دیکەی بەحەمدانی کوڕی سپارد. باوکی تەغلەب و باوکی بەرەکات و خوشکی ئەو دوانە، جەمیلە، مناڵی ناسر ئەلدەولە لەهاوسەرەکەی فاتیمە، کچی ئەحمەدی کوردی بوون کەجڵەوی کاروباری ناسر ئەلدەولەی لەدەستا بوو. فاتیمە لەگەڵ باوکی تەغلەبی کوڕی یەکیگرت و ناسر ئەلدەولەیان گرت –ئاماژەمان پێدا–. ناسر ئەلدەولە هەوڵیدا بیانگرێت و لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ حەمدانی کوڕی نووسی و داوای لێکرد لەبەرابەر ئەو دەستەیە هاوکاری بکات، بەڵام ئەم نامەیە کەوتە دەست مناڵەکانی دیکەی ناسر و رێگەیان نەدا بینێرێت و بەدەستی حەمدان بگات. ئەوان لەباوکی خۆیان ترسان و وشیار بوونەوە و ترسیان لەباوك، ناچاری کردن بۆ قەلاّی کەواشی ببەن.

حەمدان ئاگادار بوویەوە و پێی ناخۆش و دوژمنایەتی ئەوانی بۆ ئاشکرا بوو. حەمدان بوێرترینی کوڕی ناسر ئەلدەولە و لەکاتی مەرگی مامی، سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان، لەرەحبەوە رووی کردە ڕەققە و ئەو دیارەی خستە ژێر فەرمانی خۆی. دواتر رێگەی نەسیبینی گرتەبەر و سوپاییەکانی خۆی کۆکردەوە و داوای لەبراکانی کرد باوکی ئازاد بکەن و پێگەکەی بۆ بگێڕنەوە. باوکی تەغلەب، مەبەستی ڕووبەڕووی بوونەوەی حەمدانی کرد. حەمدان پێش جەنگ ڕۆشتە ڕەققە. باوکی تەغلەب شوێنی کەوت و گەمارۆی خستەسەر. دواتر هەردووك لەسەر بنەمای دەخڵ، پەیمانی ئاشتییان بەست و هەرکام بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە.

ناسر ئەلدەولە حەسەن کوڕی باوکی هەیجا عەبدوللە کوڕی حەمدان کوڕی حەمدونی تەغلەبی چەند مانگێك زیندوو بوو تا ئەوەی سەرئەنجام لەرەبیع الاوەلی ٣٥٨/ ٦٩٦ زایینی مرد و لەتەل (تەپۆڵکە) تەوبە لەرۆژهەلاّتی موسڵ، بەخاك سپێردرا. باوکی تەغلەب دوای مەرگی ناسر ئەلدەولە، دەستی بەسەر زەوییەکانی حەمدانی برای گرت و باوکی بەرەکاتی (برای) بۆ جەنگی حەمدانی برای ڕەوانە کرد. کاتێك لەرەحبە نزیك کەوتەوە، ژمارەیەك لەسوپاییەکانی حەمدان داوای

ئەمانیان لێکرد. حەمدان بەرەو عێراق هەڵات و پەنای بۆ بەختیار برد و لەرەمەزانی ٩٦٩/٣٥٨ زایینی گەیشتە ئەو شارە. بەختیار ڕێزی گرت ودیاری گرانبایی پێبەخشی و ئەوەی کەسێکی وەك ئەوی بێ نیاز دەکرد، بۆی دابین کرد. دواتر نەقیب باوکی ئەحمەدی موسەوی، باوکی شەریفی ڕەزی بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی لەنێوان حەمدان و باوکی تەغلەب ڕەوانە کرد و هەردووك پەیمانی ئاشتییان بەست و حەمدان بۆ ڕەحبە گەڕایەوە. ئەو لەجومادی الاولی ٩٧٠/٣٥٩ زایینی لەبەغدادەوە بەڕێکەوت.

کاتێك باوکی بەرەکات لەبەڕێکەوتنی براکەی بەرەو ڕەحبە ئاگادار بوویەوە، ڕەحبەی بەجێهێشت. حەمدان ڕۆشتە ناو شارەکە. باوکی تەغلەبی برای نامەی بۆ نووسی و داوای لێکرد بڕواتە لای بەڵام حەمدان ڕازی نەبوو. باوکی تەغلەب گەڕایەوە و براکەی، باوکی بەرەکاتی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد و دووبارە حەمدان ڕەحبەی بەجێهێشت. باوکی بەرەکات دەستی بەسەر ڕەحبەدا گرت و یەکێك لەسوپاییەکانی وەك نوێنەری خۆی لەشارەکە بەجێهێشت و دواتر بۆ ڕەققە و دواتر بۆ عەرەبان گەڕایەوە.

کاتێك حەمدان (لەدەشتی تەدمور بوو) لەگەڕانەوەی باوکی بەرەکات ئاگادار بوویەوە، لەمانگی شەعبان، بۆ ڕەحبە گەڕایەوە و لەکاتی شەودا گەیشتە شارەکە. دەستەیەك لەهاوەڵانی بەدیواری شارەکەدا سەرکەوتن و دەروازەکانیان بۆ کردەوە و حەمدان ڕۆشتە ناو شارەکە. ئەم کارە بەئارامی ئەنجام درا و کەس لەسەربازەکانی ناو شارەکە ئاگادار نەبوونەوە. لەبەرەبەیاندا فەرمانیدا فوو بەکەڕەناکاندا بکەن. سەربازەکانی دەرەوەی ڕەحبە گومانیان کرد دەنگی کەڕەنا لەدەرەوەی شارە. لەم کاتەدا سوپاکەی حەمدان هەرکەسێکیان دەگرت، ئەسیریان دەکرد تا ئەوەی هەموویان گرفتار بوون. دەستەیەك لەوانی کوشت و دەستەیەکی بەزیندووی هێشتەوە. باوکی بەرەکات کاتێك لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، بۆ قرقیسیا گەڕایەوە و لەگەڵ حەمدانی برای دووبەدوو گفتوگۆیان کرد بەڵام ڕێکنەکەوتن. باوکی بەرەکات بەحەمدانی وت: من بۆ عەرەبان دەگەڕێمەوە و نامە بۆ باوکی تەغلەب دەنووسم تا خواستەکانی تۆ بێنێتەدی.

باوکی بەرەکات بۆ عەرەبان گەڕایەوە و حەمدان لەکەناری فورات گوزەری کرد و شوێنپێی براکەی هەڵگرت و ئەوی لەعەرەبان گرت (چوونکە ئاسوودە بوو). باوکی بەرەکات بێ کەرەستەی جەنگ رووبەرووی سەربازەکانی براکەی بوویەوە. جەنگ لەنێوان ئەوان گەرم بوو. باوکی بەرەکات خۆی هەڵدایە ناو ئەوان و حەمدانی برای پێی گەیشت. گورزێکی لێداو لەپێی خست و دواتر ئەسیری کرد. باوکی بەرەکات لەهەمان رۆژ کەسێی رەمەزان/ بیست و دووی جولای بوو، مرد. جەنازەی بێ گیانی ئەویان بردە موسڵ و لەتەل تەوبە لای گۆڕی باوکیان بەخاکیان سپارد.

باوکی تەغلەب سوپای رازاندەوە تا بۆ جەنگی حەمدان بەرێکەوێت. پێشتر باوکی فوارسی برای بۆ نەسیبین ڕەوانە کرد. کاتێك محەممەد گەیشتە نەسیبین، نامەیەکی بۆ حەمدانی برای نووسی و پێگەی ئەوی پێش باوکی تەغلەب خست. باوکی تەغلەب لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە. کەسی بەدوای محەممەددا نارد و ئەوی بۆ لای خۆی بانگ کردەوە تا بەدرۆ، زەوییەکانی تایبەت بەو فراوانتر بکات. کاتێك محەممەد گەیشتە بارەگاکەی، ئەوی گرت و بۆ قەڵای کەواشی موسڵی نارد و دەستی بەسەر سامانەکانیدا گرت. سامانەکانی بەرابەر بوو لەگەڵ پێنسەد هەزار دینار.

کاتێك باوکی تەغلەب، محەممەدی گرت، ئیبراهیم و حسەین دوو کوڕەکەی ناسر ئەلدەولە، لەترسی باوکی تەغلەب بۆ لای حەمدانی برایان هەڵاتن و لەگەڵ ئەو کۆبوونەوە و ڕێگەی سنجاریان گرتەبەر. باوکی تەغلەب لەرەمەزانی ٣٦٠/ جونی ٩٧١ زایینی لەموسڵەوە بەرێکەوت. دوو براکەی باوکی تەغلەب، ئیبراهیم و حسەین کەتواناى خۆڕاگری لەبەرابەر ئەویان نەبوو، بۆ فریودانی نامەیەکیان بۆ نووسی و خوازیاری گەڕانەوە بوون بۆ ئەوەی بتوانن بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بیکوژن. باوکی تەغلەب بەخواستەکەیان رازی بوو. ئەو دوانە بۆ لای باوکی تەغلەب گەڕانەوە و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی حەمدان بەشوێنیانەوە بوون. لەم کاتەدا حەمدان لەسنجارەوە بۆ عەرەبان گەڕایەوە. یار و هاورێی حەمدان داوای ئەمانی لەباوکی تەغلەب کرد و ئەوی لەفریوی دوو براکەی، ئیبراهیم و حسەین، ئاگادار کردەوە. باوکی تەغلەب مەبەستی گرتنی ئەوانی کرد بەلاّم ئاگادار بوونەوە

و هەڵاتن.

دواتر ئێن نەما، کۆیلە و جێگری حەمدان لەرەحبە، هەموو سامانەکانی ئەوی لەرەحبە زەوت کرد و پەیوەستی سوپاکەی باوکی تەغلەب لەحەڕان بوو. سوپاکەی باوکی تەغلەب لەحەران لەژێر فەرمانی سەلامەی بەرقعیدا بوون. حەمدان بەناچاری بۆ رەحبە گەڕایەوە و باوکی تەغلەب رێگەی قرقیسیای گرتەبەر و دەستەیەکی نارد تا بەگوزەڕ کردن لەفورات بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکەنە سەر حەمدان و سەرکوتی بکەن. حەمدان هەڵات و باوکی تەغلەب دەستی بەسەر رەحبەدا گرت و سەر لەنویْ دیواری شارەکەی دروست کردەوە و بۆ موسڵ گەڕایەوە و لەزیحەججەی ٣٦٠/ سێپتامبەری ٩٧١ زایینی گەیشتە موسڵ.

حەمدان رێگەی بەغدادی گرتەبەر و لەکۆتایی زیحەججەی ٣٦٠/ ئۆکتۆبەری ٩٧١ ڕۆشتە ناو بەغداد و لەگەڵ ئیبراهیمی برای پەنایان بۆ بەختیار برد. براکەی تریان، حسەین، پەنای بۆ باوکی تەغلەب برد. بەختیار، چەندین دیاری گرانبایی بەحەمدان و ئیبراهیمی برای بەخشی و رێزی لیْ گرتن و چاکەی لەگەڵ کردن.

## کرداری رۆمییەکان لەشام و جەزیرە

لەم ساڵەدا پاشای رۆم هاتە ناو شام و کەس رێگەی لێنەگرت و رووبەرووی نەبوویەوە. ئەو تا تەرابلوس پێشڕەوی کرد و ئاوەدانییەکانی سووتاند و گەمارۆی خستە سەر قەڵای عەرقە و بەسەریدا زاڵ بوو و تاڵانی کرد و هەموو دانیشتووانەکەی ئەسیر کرد.

دانیشتووانی تەرابلوس، فەرماندارەکەی خۆیان لەبەر ستەمکاری، لەشارەکە دەرکردبوو. ئەو مەبەستی عەرقەی کرد بەڵام بەدەستی رۆمییەکان ئەسیر و هەموو سامانەکەی تاڵان کرا.

دواتر پاشای رۆم رێگەی حیمسی گرتەبەر. خەڵکی حیمس شارەکەیان چۆڵ کردبوو. پاشای رۆم شارەکەی سووتاند و بۆ شارە بەستێنییەکان گەڕایەوە و هەموو ئەو شارانەی سووتاند و وێرانی کرد و هەژدەی مینبەری لەگەڵ زەوی یەکسان کرد. ژمارەیەکی زۆر لەگوندەکانی گرت کەژمارەدنیان ئەگەری نییە. دوو مانگ لەشام مایەوە. بۆ هەر شوێنێك دەیخواست دەڕۆشت و کەس رێگەی لیْ

نەدەگرت. تەنیا هەندێ جار دەستەیەك لەعەرەبە دەشتەکییەکان هێرشیان دەکردە سەر ئوردووگاکەی. دەستەیەك لەم عەرەبانە ڕۆشتنە لای پاشای ڕۆم و باوەڕیان بەئایینی مەسیحی هێنا و دەیانویست عەرەبەکان و خەڵکانی دیکە بۆ پەیوەست بوون بەخۆیان هان بدەن بەڵام عەرەبەکانی دیکە رازی نەبوون. ڕۆمییەکان ترسێکی قووڵیان لەدڵی موسوڵمانان بەجێهێشت. پاشای ڕۆم بڕیاریدا بەرەو ئەنتاکییە و حەلەب بڕوات بەڵام ئاگادار بوویەوە دانیشتووانی ئەو شارانە، ئەنبار و کەرەستەی جەنگی پێویستیان کۆکردۆتەوە و بۆ جەنگ ئامادەن. لەبەر ئەمە لەمەبەستەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و لەگەڵ نزیکەی سەد هەزار ئەسیر بۆ سەرزەمینەکەی گەڕایەوە. ئەو تەنیا کچ و کوڕە گەنجەکانی ئەسیر دەکرد و لەناو بەساڵاچووەکان بەدڵی خۆی، دەیکوشت یا رزگاری دەکرد.

حەلەب لەژێر فەرمانی قەرغویە، کۆیلەی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان بوو. ئەو – وەك ئامارژەی پێدەدرێت– باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولەی لەو شارە دەرپەڕاند و ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ڕۆمییەکان گرتەبەر و ڕۆمییەکان بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە چوونکە مەرگ و نەخۆشی لەناویاندا بڵاو بوویەوە تا ئەو جێگەی دەیانوت: هیلاکی و شەکەتی سەفەر و دووری لەماڵ و حاڵیان، ئەوانی بۆ گەڕانەوە ناچار کرد.

پاشای ڕۆم دەستەیەکی فراوانی بۆ جەزیرە نارد. ئەم دەستەیە گەیشتنە کوفرتوسا. ئەوانیش تاڵانییان کۆکردەوە، ئەسیریان کرد، سووتاندیان و گەڕانەوە. لەم کاتەدا باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان، نەدەنگی بەرز کردەوە، نەهەنگاوی بردە پێش.

## زاڵبوونی قەرغویە لەحەلەب و دەرپەڕاندنی باوکی ئەلمەعالی کوڕی حەمدان لەو شارە

لەم ساڵەدا قەرغویە، کۆیلەی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان، بەسەر حەلەب زاڵ بوو وباوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولەی لەو شارە دەرپەڕاند. باوکی ئەلمەعالی ڕێگەی حەڕانی گرتەبەر بەڵام خەڵکی ئەو شارە مۆڵەتی ڕۆشتنە ناو

شارەکەیان پێنەدا. ئەو داوای لەخەڵکی حەڕان کرد ڕێگەی بدەن هاوەڵانی بۆ هەڵگرتنی توێشوو بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بڕۆنە ناو شارەکە. بەم شێوەیە خەڵکان مۆڵەتیان پێدا. کوڕی سەیف ئەلدەولە لەوێوە ڕێگەی مەیافارقینی گرتەبەر و ڕۆشتە لای دایکی. دایکی، کچی سەعید کوڕی حەمدان بوو. زۆربەی هاوەڵانی لەدەوری بڵاو بوونەوە و پەیوەستی باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان بوون.

کاتێك باوکی ئەلمەعالی گەیشتە لای دایکی، دایکی ئاگادار بوویەوە کەکۆیلە و دەبیرەکانی دەیانەوێت قۆلبەست و زیندانی بکەن – ئەو کارەی باوکی تەغلەب لەگەڵ باوکی خۆی کردی– لەبەر ئەمە دەروازەکانی شارەکەی بەست و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مۆڵەتی ڕۆشتنە ناو شارەکەی بەکوڕەکەی نەدا تا ئەو کاتەی ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی باوکی ئەلمەعالی لەوێ دوور کردەوە و ترسی گیانی خۆی لەسەر نەما. دواتر مۆڵەتی هاتنە ناو شاری بەکوڕ و کەسانی دیکەدا وڕۆژانەی بەسەردا بڵاو کردنەوە. حەڕان بەهەمان شێوە بێ فەرمانڕەوا بوو بەڵام وتاری بەناوی باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە دەخوێندرایەوە. دەستەیەك لەپیرەکان فەرمانڕەوایەتی ئەم شارەیان دەکرد و کاروباری خەڵکانیان ڕادەپەڕاند.

لەم کاتەدا باوکی ئەلمەعالی لەفوراتەوە ڕۆشتە شام و مەبەستی حەماتی کرد و لەوێ مایەوە. چەند و چۆنییەکەی لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٩٨٢/٣٧٢ زایینی باس دەکەین.

## شۆڕشی باوکی خزر لەئەفریقییە

لەم ساڵەدا باوکی خزری زەناتی(خارجی) لەئەفریقییە ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستەیەکی فراوان لەبەربەرەکان و نەکار لەدەوری کۆبوونەوە. مۆعیزی عەلەوی خۆی بۆ جەنگی ئەو ئامادە کرد و گەیشتە شاری باغایە. باوکی خزر لەنزیکی ئەم شارە دەژیا و سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ کارگوزارەکەی مۆعیز لەم شارە بوو. کاتێك هەواڵی نزیك بوونەوەی مۆعیزی بیست، کەسانی دەوروبەری هەڵاتن و مۆعیز بۆ گرتنی باوکی خزر کەهەڵاتبوو، شوێنپێی هەڵگرت و ڕێگە دژوار و سەختەکانی بڕی بوو، گەڕایەوە و فەرمانی بەباوکی فتوح یوسفی بولکین کوڕی زبریدا هەنگاو بەهەنگاو شوێنپێی باوکی خزر هەڵبگرێت و بیگرێت. باوکی فتوح

شوێن باوکی خزر کەوت بەڵام نەیتوانی بیگرێت و هیچ نیشانێکی لەو بەدەست نەهێنا. مۆعیز بۆ نشینگەی خۆی لەمەنسوریە گەڕایەوە.

لەرەبیع الاوەلی ٣٥٩/ ژانویەی ٩٧٠ زایینی، باوکی خزری شۆڕشی هاتە لای مۆعیز و داوای ئەمانی کرد و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکان نیشاندا. مۆعیز بەشادمانی بەداواکەی رازی و رۆژانەیەکی بەرچاوی بۆ دیاریکرد.

ماوەیەك دواتر نامەکانی جەوهەری لەمیسر و شامەوە بەدەست گەیشت کەبەناوی ئەو لەمیسر و شام وتاری خوێندۆتەوە. جەوهەر داوای لەمۆعیز دەکرد بەرەو میسر بەرێکەوێت. مۆعیز شادمان و ئەم سەرکەوتنەی بەخەڵکان راگەیاند. شاعیرەکان وەسفیان کردووە. یەکێك لەوان محەممەد کوڕی هانی ئاندۆلۆسی بوو:

یوقل بنو عباس: قد فتحت مصر فقل لبنی عباس: قد قضی الامر

واتاکەی: منداڵەکانی عەباس دەڵێن: میسر دەستی بەسەردا گیرا. بەمنداڵەکانی عەباس بڵێ: کار لەکار ترازا.

## ڕۆشتنی باوکی بەرەکات کوڕی حەمدان بۆ مەیافارقین و تێکشکانی ئەو

لەزیقەعدە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە باوکی بەرەکات کوڕی ناسر ئەلدەولە لەگەڵ سوپایەك هێرشی کردە سەر مەیافارقین بەڵام هاوسەری سەیف ئەلدەولە دەروازەکانی شارەکەی بەست وڕێگەی ڕۆشتنە ناو شارەکەی پێنەدا. باوکی بەرەکات پەیامی بۆ نارد، من تەنیا مەبەست جەنگ دژی کافر و ناباوەرەکانم هەیە و داوای هاوکاری لێکرد. هەردووك لەسەر ئەوە رێککەوتن هاوسەری سەیف ئەلدەولە دووسەد هەزار درهەم بۆ باوکی بەرەکات بنێرێت و گوندەکانی نزیك نەسیبین کە لەناو سنووری فەرمانڕەوایەتی سەیف ئەلدەولەدا بوو، بەو بسپێرێت.

دواتر هاوسەری سەیف ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە کەباوکی بەرەکات هەوڵ دەدات بەهەر شێوەیەك بێت، ڕێگەیەك بۆ ڕۆشتنە ناو شارەکە بدۆزێتەوە. چەند کەس لەکۆیلەکانی سەیف ئەلدەولەی بۆ ئوردووگای باوکی بەرەکات نارد تا پێیان بوترێت: ئەمە سزای سەوەری ئێوە نییە کە لەگەڵ کەسانی ناو پەردە و منداڵەکانی ئەو بەم شێوەیە هەڵس و کەوت بکەن. ئەوان لەمەبەستەکەی خۆیان و جەنگ دژی ئەوان پەشیمان بوونەوە. دواتر هاوسەری سەیف ئەلدەولە، پیاوەکانی خۆی

کۆکردەوە و شەوانە هێرشی کردە سەر باوکی بەرەکات. باوکی بەرەکات هەڵات و سامان و ئوردووگاکەی تالآن کرا و ژمارەیەك لەهاوڕێ و کۆیلەکانی کوژران. باوکی بەرەکات نامەیەکی بۆ هاوسەری سەیف ئەلدەولە نووسی کەمەبەستێکی خراپی لەسەردا نەبووە. هاوسەری سەیف ئەلدەولە بەنەرمی وەڵامی دایەوە و بەشێك لەوەی لەئوردووگاکەی تالآنی کردبوو، بۆی گەڕاندەوە. هەروەها سەد هەزار درهەمی پێدا و ئەسیرەکانی ئازاد کرد.

لەم کاتەدا کوڕەکەی باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە لەحەلەب سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ قەرغویە، کۆیلەکەی باوکی بوو.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەدەی موحەرەم/ پێنجی دێسامبەری ئەم ساڵە خەڵکانی بەغداد بەکارێکەوە سەرقاڵ بوون کە لەمە بەدووا بوو بەئایینی ئەوان چوونکە لەم ڕۆژەدا بازارەکانیان بەست و لەکاری ڕۆژانە دەستیان هەڵگرت وبۆ کوژرانی حسەین کوڕی عەلی، فرمێسکیان لەچاو باراند و لەخۆیاندا.

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان نوێنەریان بۆ لای منالەکانی نومەیر و عەرەبەکانی دیکە نارد و بۆ فەرمانبەری کردنی خۆیان هانیاندان. عەرەبەکان ڕازی بوون و سوێندی فەرمانبەرییان خوارد. باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان بۆ قەرەمتییەکانی هەجەر چەندین دیاری گرانبایی نارد کەبەهاکەیان دەگەیشتە پەنجا هەزار درهەم.

لەم ساڵەدا شاپور کوڕی باوکی تاهیری قەرەمتی داوای لەمامەکانی خۆی کرد سوپا و سەرکردایەتی پێ بسپێرن و بیری خستنەوە کەباوکی ئەو پەیمانەی لێ وەرگرتوون. مامەکانی ئەویان لەماڵەکەی خۆی زیندانی کرد و پاسەوانیان بۆ دانا و لەنیوەی ڕەمەزان/ چواری ئۆگۆست، جەنازەی بێ گیانی ئەویان هێنایەدەر و بەخاکیان سپارد و ڕێگەیان نەدا کەسە شینی بۆ بگێرێت بەڵام دوای یەك حەفتە مۆڵەتی ئەو کارەیان پێدان.

لەشەوی پێنجشەممە، چواردەی ڕەجەب/ پێنجی جونی ئەم ساڵە مانگ بەتەواوی گیرا.

لەشەعبان/ جونی ئەم ساڵە لەنێوان باوکی عەبدوللە کوڕی داعی عەلەوی و

عەلەوییەکی دیکە بەناوی ئەمیرەك کەهەمان باوکی جەعفەر سائیر فی الله بوو، جەنگ روویدا و ژمارەیەکی زۆر لەدەیلەمی و گیلانییەکان کوژران و باوکی عەبدوللە کوڕی داعی ئەسیر و لەقەلایەك زیندانی کرا و لەموحەرەمی ٣٥٩/ نۆڤەمبەری ٦٩٦ ئازاد و بۆ فەرمانڕەوایەتییەکی گەڕایەوە و باوکی جەعفەر وەك سوپاسالاری ئەو دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا بەختیار، وەزیرەکەی، باوکی فەزڵ عەباس کوڕی حسەین و هەموو هاوەڵانی ئەوی گرت و زەوی و سامانەکانی ئەوانی زەوت کرد و باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەباسی وەك وەزیر دانا بەلام دواتر ئەوی لەسەر کار لابرد و دووبارە ئەو پێگەی بەباوکی فەزڵ بەخشییەوە.

لەم ساڵەدا گرانی لەعێراق دەرکەوت و بارودۆخی خەڵکان شپرزە بوو. حکومەت نرخی خواردەمەنییەکانی بەرز کردەوە و پەرێشانی زیادی کرد. حکومەت ناچار کرا زیادەی نرخ لەسەر کەل و پەلەکان هەڵبگرێت و بەم شێوەیە ڕەنجی سەرشانی خەڵکان کەمی کرد. خەڵك لەبەر گرانی لەعێراقەوە بەرەو موسڵ و شام و خوراسان کۆچیان کرد.

لەم ساڵەدا شێرزاد، کەبەسەر بەختیاردا زاڵ بوو، لەشارەکە دەرکرا. ئەو وەزیر و سوپای لەژێر فەرماندا بوو. سوپا لێی ترسا و تورکەکان مەبەستی کوشتنیان کرد بەلام سەبوکتەکین ڕێگەی لێگرتن و وتی: بیترسێنن تا هەڵبێت. شێرزاد لەبەغداد هەڵات و پارێزگاری کردن لەزەوی و سامانەکانی خۆی خستە ئەستۆی بەختیار بەلام کاتێك لەبەغداد دوورکەوتەوە، بەختیار هەموو سامان و زەوییەکانی ئەوی زەوت کرد. ئەمە یەکێکە لەخاڵە لاوازەکانی بەختیار کەلێرەوە زیانی پێدەگەیشت.

شێرزاد ڕۆشتە لای ڕۆکن ئەلدەولە تا کاروباری بەختیار لەگەڵ ئەو سامان بدات بەلام لەکاتی گەیشتنی بۆ ڕەی، مرد.

لەم ساڵەدا عوبەیدالله کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد باوکی فەتح، نەحوی عەرەبی، ناسراو بەبەجەخجەخ مرد.

لەم ساڵەدا عیسای پزیشك، کەپزیشکی قاهیر بالله لێپرسراو لەدەوڵەتەکەی ئەودا بوو، مرد. ئەو دوو ساڵ پێش مردن سۆمای چاوی لەدەستدا. لەساڵی ٨٨٤/٢٧١ زاییینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و پە نجا و نۆی کۆچی (٩٧٠ زایینی)

## زاڵبوونی ڕۆمییەکان لەئەنتاکییە

لەموحەرەم/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، ڕۆمییەکان بەسەر شاری ئەنتاکییەدا زاڵ بوون.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ڕۆمییەکان گەمارۆیان خستە سەر قەڵایەك لەنزیك ئەنتاکییە بەناوی لۆقا. ڕۆمییەکان لەگەڵ دانیشتووانی ئەم قەڵایە پەیمانی ئاشتییان بەست چوونکە مەسیحی بوون بەو مەرجەی لەم قەڵایەوە بەرەو ئەنتاکییە بڕۆن و وانیشان بدەن لەترسی ڕۆمییەکان قەڵاکەیان بەجێهێشتووە. کاتێك گەیشتنە ئەنتاکییە، لەگرتنی ئەو شارە، هاوکاریی ڕۆمییەکانیان کرد و دوای ئەم ڕێککەوتنە، ڕۆمییەکان دەستیان لەدانیشتووانی لۆقا هەڵگرت و خەڵکانی لۆقا لەئەنتاکییە، نزیك، کوێستانەکانی ئەو سنووورە ئوردوویان لێدا.

دوو مانگ دوای ڕاگوێزانی ئەوان، ڕۆمییەکان هاوڕێ لەگەڵ براکەی نەقفور و چل هەزار سەرباز، دەستیان بەسەر دیواری ئەنتاکییەدا گرت و بەو کوێستانەی خەڵکانی لۆقا تیاییدا نیشتەجێ ببوون، سەرکەوتن. کاتێك دانیشتووانی ئەنتاکییە بینیان بەسەر ئەم بەشەدا زاڵ بوون، خۆیان لەبەرزایی دیوارەکە هەڵدایە خوار و بەم شێوەیە ڕۆمییەکان شارەکەیان گرتەدەست و دەستیان بۆ شمشێر برد و منداڵ و پیرەکانیان لەشارەکە دوور خستەوە و وتیان: بۆ هەرکوێ دەخوازن، بڕۆن. پیاوان و ژنانی گەنج و مێردمنداڵە کچ و کوڕەکانیان ئەسیر و لەگەڵ خۆیان بۆ سەرزەمینی ڕۆمیان دەبرد. ژمارەی ئەسیرەکان زیاتر لەبیست هەزار کەس بوو. ئەم گەمارۆیە لەزیحەججە/ ئۆکتۆبەر دەستی پێکرد.

## زاڵبوونی رۆمییەکان لەحەلەب و گەڕانەوەیان لەو شارە

کاتێك رۆمییەکان بەسەر ئەنتاکییەدا زاڵ بوون، سوپایەکی گەورەیان بۆ گرتنی حەلەب رەوانە کرد. لەو کاتەدا باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە کەدژی قەرغویە دەجەنگی، گەمارۆی خستبووە سەر حەلەب. کاتێك باوکی ئەلمەعالی ئاگادار بوویەوە سوپای رۆمییەکان ریگەی حەلەبیان گرتۆتەبەر، لەدەوروبەری حەلەب دوورکەوتەوە و رێگەی دەشتی گرتەبەر بۆ ئەوەی لەرۆمییەکان بەدوور بێت. رۆمییەکان گەمارۆیان خستە سەر حەلەب. قەرغویە و دانیشتووانی ئەو شارە پەنایان بۆ قەڵای شارەکە برد. رۆمییەکان شارەکەیان خستە ژێر فەرمانی خۆیان و گەمارۆیان خستە سەر قەڵاکە. دەستەیەك لەخەڵکانی حەلەب رۆشتنە لای رۆمییەکان و لەنێوان ئەوان و قەرغویە بوونە نێوەنجیگەر. پەیك و نێردەکان هاتوچۆیان کرد و سەرئەنجام لەسەر ئەوە رێککەوتن لەبەرابەر ئەو بڕە پارەی قەرغویە دەیدات، سازگاری و پەیمانی ئاشتی ببەستن و رۆمییەکان مافی ئەوەیان هەبێت لەکاتی جەنگ، نیازەکانی خۆیان لەگوندەکانی دەوروبەر دابین بکەن و قەرغویە رێگە نەدات خەڵکان ئەو گوندانە چۆڵ بکەن.

بەگرتنی حەلەب، حەمات، حیمس، کوفر تاب، مەعرە، ئەغامیە، شیزر و قەڵاکان و گوندەکانی نێوان ئەم ناوچانە کەوتە دەستی رۆمییەکان. موسوڵمانان بارمتە رۆمییەکانیان ئازاد کرد و لەبەرابەردا، رۆمییەکان حەلەبیان چۆڵ کرد و موسوڵمانان دووبارە دەستیان بەسەر شارەکەدا گرتەوە.

## زاڵبوونی رۆمییەکان لەمەلازکەرد

لەم ساڵەدا پاشای رۆم سوپایەکی بۆ مەلازکەرد، لەکەنارەکانی ئەرمەنستان رەوانە کرد. ئەم سوپایە گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە و باروذۆخی لەموسوڵمانانی ئەو دیارە دژوار و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. رۆمییەکان پێگەیان بەرز بوویەوە و موسوڵمانان ترسی ئەوانیان کەوتە دڵ.

ڕۆمییەکان بەدڵخواز دەستدرێژییان دەکردە سەر ناوچەکان بێ ئەوەی کەس ڕێگرییان لێ بکات.

## ڕەوانە بوونی کوڕی عەمید بەرەو حەسنەوییە

لەم ساڵەدا ڕۆکن ئەلدەولە، وەزیرەکەی، باوکی فەزڵ کوڕی عەمیدی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ سەرزەمینی حەسنەوییە ڕەوانە کرد.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: حەسنەوییە کوڕی حسەینی کوردی لەبەر سەرقاڵ بوونی ڕۆکن ئەلدەولە، دەرفەتی قۆستەوە و پێگەی خۆی بەرز و بەهێز کرد. ڕۆکن ئەلدەولە لەبەر ئەوە گرنگی بەحەسنەوییە دەدا چوونکە لەکاتی هێرشی خوراسانییەکان، هاوکاری دەیلەمییەکانی دەکرد و لەبەر ئەمە کەمتەرخەمییەکانی ئەو لەبەر چاو نەدەگرت. حەسنەوییە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی دەکردە سەر کاروانەکان و کاتێک ڕۆکن ئەلدەولە لەکارەکانی ئاگادار بوویەوە، هیچی نەوت و بێدەنگی هەڵبژارد.

لەم کاتەدا لەنێوان حەسنەوییە و سەهلان کوڕی موسافیر ناسازگارییەکی ئەوتۆ کەوتەوە کەسەهەلان مەبەستی جەنگی ئەوی کرد. حەسنەوییە شکستی پێهێنا و سەهلان و سوپاکەی ڕوویان کردە ناوچەیەك کەلێی کۆدەبوونەوە. حەسنەوییە شوێنپێی هەڵگرت و لەو ناوچەیە گەمارۆی خستە سەریان. حەسنەوییە چیلکە و پوش و ئاگرگرەی زۆری کۆکردەوە و بەدەروی سوپاکەی سەهلان ئاگرێکی گەورەی داگیرساند. لەبەر ئەوەی هاوین بوو، گەرمی ئاگرەکە و گەرمی هەتاو تەنگی پێهەڵچنین و هەموویان لەمردن نزیك بوونەوە. کاتێك ئەمەیان بینی، داوای ئەمانیان لەحەسنەوییە کرد و حەسنەوییە، هەموویانی گرت.

کاتێك ئەم هەواڵە بە ڕۆکن ئەلدەولە گەیشت، فەرمانی بەکوڕی عەمیددا بۆ جەنگی حەسنەوییە بەرێکەوێت. کوڕی عەمید لەموحەرەم/ نۆڤەمبەر لەگەڵ کوڕەکەی خۆی، باوکی فەتح، کەگەنجێکی سەرەڕۆ بوو و فەرماندان بەم و بەو سەرمەستی کردبوو، بەرێکەوت. هەندێ کار لەباوکی فەتح دەبینرا کەتوڕەیی باوکی لێدەکەوتەوە و نەخۆشییەکەی ئەوی زیاتر دەکرد. کوڕی عەمید گرفتاری

چەندین نەخۆشی ببوو و سەرئەنجام کاتێك گەیشتە هەمەدان، بەهۆی زیاد کردنی ئازاری ئەم نەخۆشییانە مرد و کوڕەکەی جێگەی گرتەوە و لەبەرابەر وەرگرتنی پارە، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ حەسنەوییە بەست و بۆ خزمەت کردنی ڕۆکن ئەلدەولە، بەرەو شاری ڕەی گەڕایەوە.

باوکی لەسەرەمەرگدا پێی وت: کەس جگە لەمناڵەکەم منی نەکوشت و بۆ لەناو بردنی بنەماڵەی عەمید، جگە لەو، لەکەس ناترسم. سەرئەنجام گومانەکانی بوونە ڕاستی.

چاکییەکانی جیهان بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارە و بەڕێوەبردنی وڵات و جوان نووسین بەرادەیەك لەباوکی فەزڵ کوڕی عەمید کۆببوویەوە کەهاوتای بۆ نەدەبینرا.

ئەو لەبەشە جۆراوجۆرەکان وەك ئەدەب، شارەزا بوو و بەیەکێك لەپسپۆڕەکانی ئەم بوارە لەقەڵەم دەدرا. هەروەها هۆنراوەی زۆری لەبەر بوو، شارەزای زانستی کۆن و ئەم زانستانە زیانی بەباوەڕەکەی نەگەیاند.

ڕووخۆشی و هاونشینی لەگەڵ هاوەڵان و بوێری و شارەزابوون لەهونەرەکانی جەنگ و ڕازاندنەوەی شارەکان، لەتایبەتمەندییە جوانەکانی ئەو بوو. عێزەد ئەلدەولە لەدەست پەروەردەکانی ئەوە و بەڕێوەبردنی وڵات و خۆش ویستنی زانست و زانستخوازانی لەو بۆ مابوویەوە. لەکاتی مەرگ، شەست و یەك ساڵ لەژیانی تێدەپەڕی. بۆ ماوەی بیست و چوار ساڵ وەزیر بوو.

## چۆنیەتی کوژرانی نەقفور، پاشای ڕۆم

لەم ساڵەدا نەقفور، پاشای ڕۆم کوژرا. ئەو لەبنەماڵەی پاشایەتی نەبوو. ئەو دوموستوق بوو. دوموستوق بەکەسێك دەوترا کەبەشی ڕۆژهەڵاتی کەنداوی قوستەنتەنییە بەڕێوە دەبرد. زۆربەی ئەم کەنارە ئەمڕۆ - لەکاتی ژیانی نووسەر- بەدەستی مناڵەکانی قەلج ئەرسەلان بەڕێوە دەبرێت و هەرکەس جڵەوی کاروبارەکانی دەگرێتە دەست، بەدوموستوق ناوی دەبرێت. نەقفور، بەرابەر

بەموسوڵمانان سەختگیر بوو. ئەو کەسەیە لەرۆژگاری سەیف ئەلدەولە، دەستی بەسەر حەلەبدا گرت و لای رۆمییەکان پێگەی بەرز بوویەوە. ئەو بوو دەستی بەسەر تەرسوس، مەسیسە، ئەزەنە، عەین زەربە و شوێنەکانی دیکەدا گرت.

نەقفوز بەرەچەڵەك مەسیحی نەبوو. منالی پیاوێکی موسوڵمان لەخەڵکانی تەرسوس بەناوی کوری فەقاس کەباوەری بەئاییني مەسیحی هێنا بوو. کورەکەی، نەقفور، پیاوێکی وشیار، بوێر و چارەگەری کێشەکانی ولات بوو. کاتێك هێزی زیادی کرد و پێگەی بەرز بوویەوە، پاشای پێش خۆی کوشت و دواتر فەرمانرەوایەتی رۆمی گرتەدەست. پێشتر ئامارژەمان پێدا.

کاتێك فەرمانرەوایەتی گرتەدەست، لەگەڵ هاوسەری پاشای پێشوو – لەگەڵ نارەزامەندی ئەو ژنە– پەیوەندی هاوسەرگیری بەست. ئەم ژنە دوو کوری لەهاوسەرەکەی پێشووی بۆ بەجێ مابوو. نەقفور بەردەوام هەوڵی دەدا هێرش بکاتە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان و دەسەلاتی لەو ناوچانەدا بلاو بکاتەوە. ئەو ئەم ئەندێشە و بیرۆکەی بەسەرقالی کردنی فەرمانرەواکانی ناوچە ئیسلامییەکان بەجەنگی یەکتر، هێنابوویە دی و بەم شێوەیە بارودۆخ و شیرازەی ناوچە ئیسلامییەکان تێکچووبوو. وای دانابوو هێرش بکاتە سەر هەموو سەرزەمینە ئیسلامییەکان و تالان و وێرانییان بکات و بەم شێوەیە هێزی سەرزەمینە ئیسلامییەکان سست و لەناو ببات و بیانخاتە ژێر فەرمانی خۆی. ئەو دەستی بەسەر سنوورەکانی شام و جەزیرەدا گرت و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کرد کەژماردنیان ئەگەری نییە تا ئەو جێگەی موسوڵمانان لێی دەترسان و دڵنیابوون لەوەی ئەو دەست بەسەر سەرزەمینەکانی شام، میسر، جەزیرە و دیاربەکر دەگرێت چوونکە ئەم شارانە هێزی بەرگریکاریان نەبوو.

کاتێك پێگەی بەرز بوویەوە، بەلای خوایی لەشوێنێکەوە بەرۆکی گرت کەگومانی نەدەکرد. ئەمە لەکاتێکدا بوو بریاریدا دوو کوری هاوسەرەکەی (کورەکانی پاشای پێشوو) بخەسێنێت تا چیتر کەس لەپشتی ئەوان دروست نەبێت و کەس رکەبەری فەرمانرەوایەتی منالەکانی نەکات. کاتێك دایکی ئەو دوو کورە لەم مەبەستە ئاگادار بوویەوە، نیگەران و بیری لەکوشتنی نەقفور کردەوە.

پـەیکی بـۆ لای شەمـشقیق، ئـەویش لـەو رۆژگـارەدا دوموسـتوق بـوو، نـارد و بڕیاریاندا ئەو (شەمشقیق) و هاوڕێکانی بەجل و بەرگی ژنانە بڕۆنە ماڵەکەی. ئەو بەهاوسـەرەکەی، نـەقفوری وت: ژنانێك لەخزمـەکانی بـۆ سـەردانی هـاتوون. کاتێك ئەو دەستەیە گەیشتنە لای هاوسـەری نـەقفور، ئەوانی بردە شوێنی دۆعا کردنی نەقفور کە بەماڵەکەیـەوە لکـا بـوو. کـوڕی شەمـشقیق لەقەڵافـەت و هەیبـەتی نـەقفور دەترسا بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خواستی ژنەکەی هێنایەدی. لەشەوی لەدایك بوونی مەسیح لەم ساڵە، خەوێکی قووڵ نەقفوری بردەوە و ژن دەرگای ماڵەکەی کردەوە و هەموو پیاوەکان کەجل و بەرگی ژنانەیان لەبەر کردبوو، ڕۆشتنە ژوور و خوێنیـان ڕشـت. دەسـتەیەك لەکەسان و هاوڕێیـانی نـەقفور بـۆ هاوکـاری کردنـی هـاتن بـەڵام حەفتا و چەند کەس لەوانیش کوژران و بەم شێوەیە کوڕە گەورەی پاشای کوژراو، لەسـەر تـەختی پاشـایەتی دانیـشت و کـوڕی شەمـشقیق بـوو بەبەڕێوبـەری کاروبارەکانی ئەو. دەڵێن جگە لـەو شـەوە نـەبینراوە نـەقفور بێ کەرەستەی جەنگ بخەوێت وئەمە تـەنیا خواسـتی خواوەنـد بـوو چوونکە دەیویست ئـەو بکوژرێت و کۆتایی بەژیانی بێت.

## فەرمانڕەوایی کوڕی تەغلەب لەشاری حەڕان

لەبیست و دووی جومـادی الاوەل/ چـواری ئـاوریلی ئـەم سـاڵە، بـاوکی تەغلـەب کـوڕی ناسـر ئەلدەولـە کـوڕی حەمـدان هێرشـی کـردە سـەر حـەڕان و بـینی دانیشتووانی شـارەکە، دەروازەکانیـان بەسـتووە و بـۆ بـەرگری کـردن ئامـادن. ئەو رووبـەروویان بوویـەوە و گـەمارۆی خـستە سـەر شـارەکە. هـاوەڵانی کـشتوکاڵی کـەنارەکانی ئـەو شـارەیان دروێنـە کـرد چـوونکە گرانـی لـەناو ئوردووگاکـەی دەرکـەوتبوو. ئـەو تـا سـیانزەی جومـادی الاخـرە/ بیـست و چـواری ئاوریـل لەشـوێنەکەی مایـەوە. دووان لەگـەورەکانی شـار، شـەوانە هاتنـە لای و پـەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەست و ئەمانیان بۆ دانیشتووانی شارەکە وەرگرت و گەڕانەوە.

لەبەرەبەیانـدا، ئـەم دوو کەسـە خـەڵکیان لەکارەکـەی خۆیـان ئاگـادار کـردەوە. خـەڵکان نیگـەران و کەرەسـتەی جـەنگیان هـەڵگرت و مەبەسـتی کوشتنی ئـەو دوو

کەسەیان کرد بەڵام یەکێك لەپیاوان ئەوانی ئارام کردەوە و بڕیاریاندا ڕێز لەپەیمانی ئاشتییەکە بگرن. لەبەر ئەمە دەروازەکانیان کردەوە و هەموویان ڕۆشتنە لای کوڕی تەغلەب. کوڕی تەغلەب و برا و دەستەیەك لەهاوڕێکانی ڕۆشتنە ناو شارەکە و نوێژی هەینیان خوێند و بۆ ئوردووگاکەی خۆیان گەڕانەوە. باوکی تەغلەب، سەلامەی بەرقعیدی وەك فەرمانڕەوای حەڕان دەستنیشان کرد چوونکە دانیشتووانی ئەم شارە خۆیان خوازیاری ئەو بوون (لەبەر ئەوەی کەسێکی چاکەکار بوو). بەڕێوەبردنی کاروباری ڕەققەیش لەدەستی ئەودا بوو. سەلامە بەیەکێك لەگەورەکانی منداڵەکانی حەمدان لەقەڵەم دەدرا. باوکی تەغلەب لەگەڵ ژمارەیەك لەگەنجەکانی حەڕان بۆ موسڵ گەڕایەوە. بۆیە لەگەڕانەوە پەلەی کرد چوونکە منداڵەکانی ئەمیر لەموسڵ خراپەکارییان کردبووە پیشە و کارگوزارەکەی باوکی تەغلەب، بەرقعیدیان کوشتبوو. باوکی تەغلەب گەڕایەوە تا ڕێگە لەخراپەکاری ئەم دەستەیە بگرێت.

## کوژرانی سلێمان کوڕی باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس

لەم ساڵەدا سلێمان کوڕی باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس کەباوکی فەرمانڕەوای کرمان بوو، کوژرا.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ئەو بەمەنسور کوڕی نوح فەرمانڕەوای خوراسانی وت کەدانیشتووانی کرمان لەقەفەس و بەلوس (بەلوچ) ملکەچی فەرمانەکانی ئەون و بەمشێوەیە تەماحی گرتنی کرمانی لا دروست کرد. مەنسور سوپایەکی بەهاوڕێیەتی سلێمان بۆ کرمان ڕەوانە کرد و کاتێك سلێمان گەیشتە ئەو شارە، قەفەس و بەلوس و ئەوانی لەعێزەد ئەلدەولە جیابووبوونەوە، پەیوەستی بوون و بەم شێوەیە پێگەی بەرز بوویەوە و ژمارەی سوپاکەی فراوان بوون. کوڕکیر کوڕی جوستان، جێگری عێزەد ئەلدەولە لەکرمان، ڕووبەڕووی بوویەوە و سەرئەنجام سلێمان و دوو برازاکەی، منداڵەکانی ئەلیەسع، بەکر و حسەین، کوژران و ژمارەیەکی فراوان لەفەرماندەکانی خوراسانیش گیانیان لەدەستدا و سەری بڕاوی ئەوان بۆ لای عێزەد ئەلدەولە لەشیراز ڕەوانە کرا و ئەویش سەرەکانی بۆ

ڕۆكن ئەلدەولە نارد. ژمارەیەكی زۆریشیان ئەسیر كران.

## شۆڕش لەسەقەلییە

لەم ساڵەدا مۆعیزلدین الله، خەلیفەی عەلەوی، یەعیش، موالی حەسەن كوڕی عەلی كوڕی باوكی حسەینی وەك فەرمانڕەوای دوورگەی سەقەلییە دەستنیشان كرد. ئەو هۆزەكانی لەدار ئەلسەناعە كۆكردەوە. لەم كاتەدا لەنێوان موالییەكانی كەتامە و هۆزەكانی دیكە ناسازگاری ڕوویدا و بۆ جەنگی یەكتر شمشێریان دەركێشا. لەم جەنگەدا ژمارەیەكی زۆر لەموالییەكانی كەتامە كوژران و لەموالییەكانی سەرقوسە (ساراكوز) ژمارەیەك گیانی خۆیان لەدەستدا.

بەم شێوەیە ناسازگاری لەنێوان ئەوان تەشەنەی كرد و دوژمنایەتی باڵی بەسەردا كێشان. یەعیش بۆ سەقامگیر كردنی ئاشتی و ئارامی هەوڵی دەدا بەڵام كەسانی دیكە هاوڕێیەتیان نەدەكرد و خراپەكاران لەهەموو كەنارەكانەوە دەستدرێژییەكانی خۆیان دەست پێكرد و تاڵانكاری و خراپەكارییان كردە پیشە و پەلاماری وەرزێرەكانیاندا و ئەمان بەخشراوەكانیان سەركوت كرد. مۆعیز ئاگادار بوویەوە و یەعیشی لەسەركار لابرد و باوكی قاسم كوڕی حەسەن كوڕی عەلی كوڕی باوكی حسەینی وەك جێگر و نوێنەری براكەی دەستنیشان كرد. باوكی قاسم بەرەو سەقەلییە بەڕێكەوت و كاتێك گەیشتە ئەو سەرزەمینە، خەڵكان شادمان و ئاژاوە كۆچی كرد و هەموان بۆ فەرمانبەری كردنی ئەو هاودەنگ بوون.

## گەمارۆ خستنە سەر عیمران كوڕی شاهین

لەشەوال/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە بەختیار بۆ گەمارۆ خستنە سەر عیمران كوڕی شاهین بەرەو بوتەیحە بەڕێكەوت و یەك مانگ لەواست بەڕاو سەرقاڵ بوو. دواتر فەرمانی بەوەزیرەكەی، باوكی فەزڵدا بەرەو جامیدە وكەنارەكانی بوتەیحە بەڕێكەوێت. بنەمای فەرمانەكەی ئەوە بوو ڕووبارەكان و ڕێگە ئاوییەكانی بوتەیحە ببەستێت و بەرەو دیجلە و فاروس و ڕەبع تەیر ڕەوانی بكات. ئەو چەندین بەنداوی

دروست کرد کەدەکرا لەسەر ئەوان تا عێراق بڕۆیت. ئەم کارە درێژەی کێشا و ئاوی دیجلە زیادی کرد و ئەو بەنداوەی دروستی کردبوو، رووخا.

عیمران لەپەناگاکەی خۆی لەبوتەیحە، رووی کردە پەناگایەکی دیکە لەو ناوچەیە و سامانەکانی خۆی بۆ ئەو ناوچەیە گواستەوە. کاتێك ئاو کەمی کرد و توانیان بەرێگەکەدا بڕۆن، بینیان شوێنەکەی عیمران کوڕی شاهین چۆڵە. رۆژەکان درێژەیان کێشا و سەربازەکان لەمانەوە شەکەت و لەگەرما و مێشوولە و قرپۆکەکانی ئەم جێگە و دەستنەکەوتنی خۆراك بێزار ببوون. سوپا دژی وەزیر شۆڕشی کرد و جوێنیان پێدا و بەمانەوە لەو شوێنە رازی نەبوون. بەختیار بەناچاری لەبەرابەر وەرگرتنی برێك پارە لەعیمران پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست.

عیمران سەرەتا لێی دەترسا و ئامادە بوو پێنج هەزار درهەم بەوەزیر بدات بەڵام کاتێك پەرێشانی بارودۆخی بەختیاری بینی تەنیا دوو هەزار درهەم، ئەویش کەم کەم، پارەیدا و بارمتەی نەنارد و بۆ ڕەوانە کردنی پاشماوەی پارەکە هیچ پەیمانێکی نەدا و کاتێك سوپای بەختیار بەرێکەوت، عیمران هێرشی کردە سەر سوچ و کەنارەکانی تا ئەو جێگەی بارودۆخی ئەم سوپایە شڵەژا و شکۆی فەرماندەکانی لەناوچوو. بەختیار لەرەجەب ٣٦١/ ئاوریلی ٩٧٢ زایینی گەیشتە بەغداد.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەرەبیع الاخر/ فەوریەی ئەم ساڵە قەرغویە، کۆیلەی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان و باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە پەیمانی ئاشتییان بەست و لەحەلەب بەناوی باوکی ئەلمەعالی وتار خوێندرایەوە. ئەو لەو کاتەدا نیشتەجێی حیمس بوو. باوکی ئەلمەعالی و قەرغویە هەردووك لەسنوری خۆیان بەناوی مۆعێز لدین اللە عەلەوی، فەرمانڕەوای مەغریب و میسر، وتاریان دەخوێندەوە.

لەرەمەزان/ جولای ئەم ساڵە لەسێشەممە بازاری بەغداد ئاگرێکی مەترسیدار کەوتەوە و دەستەیەك لەژنان و پیاوان سووتان. ژمارەی گەشتیاران وکەسانی دیکە کە لەم ئاگرکەوتنەوەدا سووتان، فراوان بوو. ئەم ئاگرە بۆ چوار گەرەکی

بەغداد تەشەنەی کرد.

لەم ساڵەدا لەمەککە بەناوی موتیع الله و قەرەمتییەکان وتاریان خوێندەوە و لەمەدینە بەناوی مۆعیز لدین الله عەلەوی و لەدەرەوەی مەدینە، باوکی ئەحمەدی موسەوی، باوکی شەریفی رەزی بەناوی خەلیفە موتیع، وتاری خوێندەوە.

لەم ساڵەدا عوبەید کوڕی عومەر کوڕی ئەحمەد کوڕی باوکی قاسمی عەبەسی، شافعی لەقورئان خوێنەکان، لەقەرتوبە، مرد. ئەو چەندین نووسراوی هەیە و شوێنی لەدایك بوونی بەغداد و لەساڵی ٩٠٧/٢٩٥ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەبوبەکر محەممەد کوڕی داودی دینەوەری سۆق، ناسراو بەڕەقی کە لەگەورەکانی سۆفییەیە، لەم ساڵەدا مرد. دەستەیەك ساڵی مەرگی ئەو بە٩٧٢/٣٦٢ زایینی دەزانن.

لەم ساڵەدا قازی باوکی عەلای موحارب کوڕی محەممەد کوڕی موحارب، فەقیهی شافعی لەمانگی جومادی الاخرە/ ئاوریل کۆچی دوایی کرد. ئەو لەفیقە و کەلام بیرمەند و زانا بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەستی کۆچی( ٩٧١ زایینی )

## شۆڕشی کرمانییەکان دژی عیزەد ئەلدەولە

کاتێـک – ئاماژەمـان پێـدا– عێـزەد ئەلدەولـە دەسـتی بەسـەر کرمانـدا گـرت، خـەڵکانی قـەفس و بەلوچ پـەیمانیان بەست. بـاوکی سـەعیدی بـەلوچ و منداڵـەکانی لـەناو ئەوانـدا دەبینـران و هـەموان ڕێگـەی ناسـازگاری کردنـی عێـزەد ئەلدەولـەیان گرتەبەر و پەیمانی خۆڕاگرییان واژۆ کرد. عێزەد ئەلدەولە، عابید کوڕی عـەلی بۆ هاوکاری کورکیر کوڕی جوستان نارد و هـەردووك لەگـەڵ سوپاکەی خۆیان بەرەو جیرۆفـت بەرێکـەوتن و لـەدەی سـەفەر/ چـواردەی سـێپتامبەر گەیـشتنە یـەك و ڕووبـەڕووی دوژمـن بوونـەوە. دوو سوپا خۆڕاگرییـان کـرد و سـەرئەنجام خـەڵکانی قــەفس و هاوەڵانیــان شکــستیان خــوارد و پێــنج هــەزار کــەس لەســەرکردە و جــەنگاوەرەکانیان کــوژران. دوو کوڕەکــەی بــاوکی ســەعید لــەناو کوژراوەکانــدا دەبینرا.

لـەم کاتـەدا عابیـد کـوڕی عـەلی شـوێن هـەڵاتووان کـەوت بـۆ ئـەوەی بەتـەواوی لـەناویان ببـات. چـەند جارێـك ڕووبـەڕوویان بوویـەوە و زیـانی پێگـەیانـدن. عابیـد گەیشتە هورموز و دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرت. هەروەها سەرزەمینەکانی تیز و موکرانی خستە ژێر فەرمانی خۆی و دوو هـەزار کەسـی ئەسیر کـرد. پاشـماوەی خـەڵکان داوای ئـەمانیان بـەرز کـردەوە. قـەڵا و چیاکانی ژێـر دەسـتی خۆیـان بـەو مەرجە تەسلیم کرد کەدەست لەجەنگ هەڵبگرن و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و فەرمانە ئایینییەکان ئەنجام بدەن. عابید ڕووی کردە هۆزەکـانی حەرومییە و حاسکییە کە لەوشـکایی و دەریـا چـەتەیی و هاوکـاری سـلێمان کـوڕی بـاوکی عـەلی کـوڕی ئەلیاسـیان دەکـرد. پێـشتر ئاماژەمـان پێـدا. عابیـد ڕووبـەڕوویان بوویـەوە و ژمارەیـەکی زۆری لـێ کوشـتن و بـۆ لای عێـزەد ئەلدەولـە ڕەوانـەی کـردن. ئـەم سەرزەمینە دوای ماوەیەك، ئارامی بەخۆوە بینی.

ماوەیـەك دواتـر بەلوچـەکان سـەرقاڵی کوشـت و بڕ و بڕینی ڕێگـەکان بوونـەوە.

کاتێك عیزەد ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە، سوپای رازاندەوە و لەزیقەعدە/ ئۆگۆست ڕێگەی کرمانی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە سیرجان و خراپەکاری ئەم دەستەیە و تالانکارییەکانی ئەوان لەکرمان و سیستان و خوراسان بینی، عابید کوڕی عەلی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا شوێنپێی خراپەکاران هەڵبگرێت و لەناویان ببات. کاتێك خراپەکاران لەهێرشەکەی ئەو ئاگادار بوونەوە، ڕۆشتنە ئەو ناوچانەی گومانیان دەکرد سوپاکەی عابید ناتوانێت بڕواتە ئەو شوێنانە و دەتوانن بەئاسوودەی ژیان بەسەر ببەن. خراپەکاران کاتێك هاتنەخۆ کەبینیان سوپاکەی عابید لەهەموو قۆڵەکانەوە دەوریان دان کەتوانای هەڵاتنیان نەبوو. ئەوان ئەو ڕۆژە کەنۆزدەی ڕەبیع الاوەلی ٣٦١// یانزەی فەوریەی ٩٧٢ زایینی بوو خۆڕاگرییان کرد و لەکۆتایی ڕۆژ، هەڵاتن بەڵام زۆربەی شەڕکەرانیان کوژران و ژن و منداڵەکانیان ئەسیر کران و پاشماوەکان داویان ئەمانیان کرد و پێیان بەخشرا. ئەوان بۆ کوێستانەکان راگوێزران و عیزەد ئەلدەولە، جووتیار و وەرزێرەکانی بۆ شوێنەکانی ئەوان ڕاگوست. وەرزێرەکان زەوییەکانیان بۆ کشتوکاڵ ئامادە کرد. عابید دەستی لەخراپەکاران هەڵنەگرت و لەدەریا و وشکانی بەدوایانەوە بوو. ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و بڵاوەی بەدەستەکانیان کرد و ئارامی و ئاسایشی بۆ ناوچەکە گەڕاندەوە.

## زاڵبوونی قەرەمتییەکان لەدیمەشق

لەزیقەعدە/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە قەرەمتییەکان گەیشتنە دیمەشق و فەرمانڕەوایەتی شارەکەیان گرتەدەست و جەعفەر کوڕی فەلاحیان کوشت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك قەرەمتییەکان لەزاڵبوونی جەعفەر کوڕی فەلاح لەشام ئاگادار بوونەوە، پەرێشان و نیگەران بوون چوونکە قەرەمتییەکان پەیمانیان لەگەڵ کوڕی توغج بەستبوو ساڵانە سێسەد هەزار دیناریان پێبدات و کاتێك جەعفەر دەستی بەسەر شامدا گرت، زانیان چیتر ئەم بڕە پارەیان بەدەست ناگات. لەبەر ئەمە هێرشیان کردە سەر شام. لەو کاتەدا حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی بەهرامی قەرەمتی پێشەوای ئەوان بوو. ئەو کەسی بۆ لای عیزەد ئەلدەولە

بەختیار ڕەوانە و داوای هاوکاری مادی و کەرەستەی جەنگی لێکرد. بەختیار ڕازی بوو. بڕیاردرا کاتێک لەرێگەی شام گەیشتنە کوفە، پارە و کەرەستەی جەنگیان بەدەست بگات و کاتێك گەیشتنە کوفە و پارە و کەرەستەکانی جەنگیان وەرگرت، بەرەو دیمەشق بەرێکەوت.

جەعفەر کوڕی فەلاح لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە بەڵام گرنگی پێ نەدان و خۆی لەوان بەدوور نەگرت. قەرەمتییەکان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردەسەر و لەدەرەوەی دیمەشق گرتیان و سەرکوتیان کرد و دەستیان بەسەر ماڵ و چوارپێکانیدا گرت و شارەکەیان خستە ژێر فەرمانی خۆیان و ئەمانیان بەدانیشتووانەکەی بەخشی و ڕێگەی ڕەملەیان گرتەبەر. دەستیان بەسەر هەموو شارەکانی سەر ڕێگەکەیاندا گرت.

کاتێك مەغربییەکان لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە، لەسنوورەکەی خۆیان بەرەو یافا هەڵاتن و لەوێ سەنگەریان گرت. قەرەمتییەکان ڕەملیەیان خستە ژێر فەرمانی خۆیان و ڕێگەی میسریان گرتەبەر و سوپایەکیان ڕاسپارد تا گەمارۆ بخاتە سەر یافا. کاتێك قەرەمتییەکان گەیشتنە میسر، ژمارەیەکی زۆر لەعەرەبەکان، سوپاییەکان، ئەخشید و کافورییەکان پەیوەستیان بوون و هەموان لەعەین شەمسی میسر کۆبوونەوە. سوپای جەوهەر لەبەرابەر ئەوان ڕیزی بەست و هێرشی کردە سەریان. چەندین جەنگ لەنێوان ئەم دوو سوپایە ڕوویدا و هەموو جارێك قەرەمتییەکان سەردەکەوتن. گەمارۆیان خستە سەر مەغربییەکان. لەیەکێك لەرۆژەکان مەغربییەکانی میسر هێرشیان کردە سەر باڵی ڕاستی قەرەمتییەکان و عەرەبەکان و دەستەیەکی دیکە لەقەرەمتییەکان هەڵاتن. مەغربییەکان هێرشیان کردە سەر هێزەکانی کەناری سوپای قەرەمتی و ئەوەی دەستیان کەوت، تاڵانیان کرد. قەرەمتییەکان بەناچاری گەڕانەوە و ڕێگەی شامیان گرتەبەر و لەرەملە ئوردوویان لێدا.

دواتر قەرەمتییەکان گەمارۆیان خستە سەر یافا و بارودۆخیان لەدانیشتووانەکەی دژوار کرد.

جەوهەر لەمیسرەوە سوپایەکی بۆ هاوکاری کردنی شارۆمەندانی یافا ڕەوانە

کـرد و پـانزە کەشـتی خواردەمـەنی بەوانـدا نـارد. قەرەمتییـەکان کەشـتییەکانی خۆیـان بـۆ جـەنگی کەشـتییەکانی جەوهـەر نـارد و سـەرئەنجام دەسـتیان بەسـەر کەشـتییەکاندا گـرت. جگـە لـەدوو کەشـتی ئـەوانی دیکـە کەوتـە دەسـتی قەرەمتییەکان. ئەو دوو کەشتییەیش کەوتە دەستی هێزە رۆمییەکان.

حسەین کوڕی بەهرام پێشەوای قەرەمتییـەکان هۆنراوەیـەکی هەیـە کەبەشێکی تایبەتە بەمەغرببییەکانی هاوڕێی مۆعیزلدین الله:

زعمت رجال الغرب انی هبتها فدمی اذا ما بینهم مطلول

یا مصر ان لم اسق ارضك من دم یروی ثراك فلا سقانی النیل

واتاکەی: پیاوانی رۆژئاوا گومانیان دەکرد چاوپۆشیم لێکردن. ئەگەر بەم شێوە بێت خوێنی من لەناو ئەوان بڕژێت. ئەی میسر! ئەگەر من زەوییەکەی تۆ لەخوێن سور و خاکەکەت تێراو نەکەم، رووباری نیل تێراوم نەکات.

## کوژرانی محەممەد کوڕی حسەینی زەناتی

لەم ساڵەدا یوسف بولکین کوڕی زەیری، محەممەد کوڕی حسەین کوڕی زەناتی و دەستەیەك لەکەسـان و ئامۆزەکـانی ئـەوی کوشـت. محەممـەد لەئەفریقییـە دژی مۆعیزلـدین الله ئـاڵای شۆڕشـی بـەرز کردبوویـەوە و ژمارەیـەکی زۆر لەخـەڵکانی زەناتـە و بەربـەرەکان لـەدەوری کۆبوونـەوە. کردەوەکانی ئەو، مـۆعیزی بەئەندێشە ناچار کرد چوونکە دەیویست بەرەو میسر بڕوات. مـۆعیز دەترسا محەممەدی سەرکێش و یاخی لەم سنوورە پشتگوێ بخات.

چۆنیەتی کوژرانی زەناتی بەم شێوە بوو: ئەو لەگەڵ دەستەیەك لەکەسەکانی سەر قاڵی خواردنەوەی مەی بوون. یوسف لەمە ئاگادار بوویەوە و بەخێرایی و نهێنی هێرشی کردەسەر. زەناتی لەهاتنی ئەو ئاگادار نەبوویەوە. کاتێك زەناتی چاوی بەیوسف کەوت، بەشمشێرەکەی خۆی، خۆی کوشت. یوسف کەسانی دیکەی کوشت و ژمارەیەکی ئەسیر کرد. ئەمە پێگەی ئەوی لای مۆعیز بەرز کردەوە و سێ رۆژ بەم بۆنەوە، شادی و خۆشی گێرا.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

**لەم ساڵەدا عیزەد ئەلدەولە، کورکیر کوڕی جوستانی گرت و لای خۆی هێشتییەوە تا ئەگەڕێك بۆ پەیمانی ئاشتی بمێنێتەوە.**

**لەم ساڵەدا باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان، کچی بەختیاری بەمارەیی سەد هەزار دینار، وەك هاوسەری خۆی دەستنیشان کرد. کچی بەختیار لەم کاتەدا تەمەنی سێ ساڵ بوو. نوێنەری ئەو بۆ ڕازی بوون بەم هاوسەرگیرییە، باوکی حەسەن عەلی کوڕی عەمرۆ کوڕی مەیمون، هاوڕێی باوکی تەغلەب بوو. ئەم مارە بڕینە لەمانگی سەفەر/ دێسامبەر ئەنجامدرا.**

**لەم ساڵەدا دووپیاو لەمزگەوتی دێرماری میخائیل لەکەنارەکانی موسڵ کوژران. باوکی تەغلەب لەبەرابەردا ژمارەیەك لەمەسیحییەکانی گرت.**

**لەم ساڵەدا مۆئەیید الله کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە، ساحەب باوکی قاسم کوڕی عیبادی وەك وەزیر هەڵبژارد. ساحەب، کاروبارەکانی ڕێکخست.**

**لەم ساڵەدا باوکی قاسم کوڕی سلێمان کوڕی ئەیووبی تەبەرانی، نوسەری (معاجم ثلاثە) لەتەمەنی سەد ساڵی لەئیسفەهان مرد. ئەبوبەکر محەممەد کوڕی حسەینی ئاجوری لەمەککە مرد. ئەم دوانە لەحافزانی حەدیس بوون.**

**لەم ساڵەدا سەری کوڕی ئەحمەد کوڕی سەری باوکی حەسەنی کێندی ڕەفا، وتاردەری موسڵی، لەبەغداد کۆچی دوای کرد.**

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و یەکی کۆچی ( ٩٧٢ زایینی )

## کرداری ڕۆمییەکان لەجەزیرە

لەموحەڕەم/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە، پاشای ڕۆم بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردە سەر ڕۆها و کەنارەکانی و دواتر ڕێگەی جەزیرەی گرتەبەر و لەگەڵ سوپاکەی گەیشتنە نەسیبین و تالآنیان کرد و ئەوەی بینیان، ئەسیر و سووتاندیان و شارەکەیان وێران کرد. ڕۆمییەکان ئەم بەلآیان بەسەر دیاربەکریش هێنا. باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان هیچ جموجۆڵێکی لەخۆی نیشاندا و هیچ هەوڵێکی بۆ دوورخستنەوەی ڕۆمییەکان نەدا. تەنیا پارەی بۆ پاشای ڕۆم نارد تا خۆی لەزیانەکان بەدوور بێت.

دەستەیەك لەم سەرزەمینە ڕێگەی بەغدادیان گرتەبەر و لەناو مزگەوت و پەرەستگاکان، هانی موسوڵمانیاندا و باسی تالآن، کوشتار و ئەسیر کرانی ژن و منالەکانیان بەدەستی ڕۆمەکان کرد. خەڵك لەوتەکانی ئەوان نیگەران بوون. خەڵکانی جەزیرە، دانیشتووانی بەغدادیان لەئاوەلآ بوونی ڕێگەکان و تەماح و هێرشی ڕۆمییەکان ترساند و بیریان خستنەوە کەئەگەر ڕۆمییەکان مەبەستی هێرش کردنە سەر بەغداد بکەن، هیچ کەسك و لەمپەرێك لەڕێگەدا بوونی نابێت و کەس ناتوانێت ڕێگەیان لێ بگرێت. دانیشتووانی بەغداد پەیمانیان بەست و مەبەستی کۆشکی خەلیفە، تائیع الله یان کرد بەلآم ڕێگەی ئەو کارەیان لێ گیرا و دەروازەکانی کۆشکیان بەست. هێرشبەران ئەو جوێن و وتانەیان هێنایە سەرزمان کەتواناى گێڕانەوەیمان نییە.

بەختیار لەم کاتەدا لەکەنارەکانی کوفە سەرقاڵی ڕاو بوو. ژمارەیەك لەسەرکردەکانی بەغداد ڕۆشتنە لای و سەرقاڵ بوونی ئەو بەڕاو و جەنگ لەگەڵ عیمران کوڕی شاهینی موسوڵمان و پشتگوێ خستنی جیهاد لەگەڵ ڕۆمییەکان و ڕێ نەگرتنی لەهێرشی ڕۆمییەکان بۆ سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکانیان بەکارێکی قێزەون لەقەڵەمدا. بەختیار بەڵێنی پێدان لەم جەنگەدا هاوکارییان بکات. کەسی بۆ

لای سەبوکتەکینی پەردەدار نارد و فەرمانی پێدا خۆی ئامادە بکات و فەرمانی جیهادی گشتی بەهەموان رابگەیێنێت. سەبوکتەکین ئەو کارەی ئەنجامدا. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە کەلەژماردن نەدەهاتن. بەختیار کەسی بۆ لای باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان، فەرمانڕەوای موسڵ نارد و فەرمانی پێدا خواردەمەنی و وێنجە کۆبکاتەوە. ئەوی لەمەبەستی خۆی بۆ هێرش کردنە سەر رۆمییەکان ئاگادار کردەوە. باوکی تەغلەب بەخۆشحاڵییەوە بەداواکەی رازی و فەرمانەکانی ئەنجامدا.

## شۆڕش لەبەغداد

لەم ساڵەدا لەبەغداد شۆڕشێکی بەربلاو سەریهەڵدا و خەڵکان زیاد لەرادە، دەمارگیرییان لەخۆیان نیشاندا و بوونە چەندین دەستە. سەرسەرییەکان خۆیان هەڵدایە ناو ئەم شۆڕشە و خراپەکارییان کردە پیشە و سامانی خەڵکیان تاڵان دەکرد.

هۆکارەکەی وەك ئاماژەمان پێدا ئامادە بوونی خەڵکانی بەغداد بۆ جیهاد بوو. ژمارەی ئەوان بەرادەیەك زیادی کرد کەچەندین دەستە لەنەوجەوانان، گەنجەکان، سوننییەکان، شیعەکان و کوڵان و گەڕەکان دروست بوو و سامانەکانیان تاڵان دەکرد و خوێنی خەڵکانیان دەڕشت و ماڵەکانیان دەسووتاند. گەڕەکی کەرخ تەنیا یەکێك لەگەڕەکە سووتاوەکان بوو. ئەم گەڕەکە شوێنی بازرگانەکان و شیعەکان لەقەڵەم دەدرا و لەبەر ئەمە لەنێوان نەقیب باوکی ئەحمەدی موسەوی و باوکی فەزڵ شیرازی(وەزیر) ناسازگاری هاتە ئاراوە.

بەختیار کەسی بۆ لای خەلیفە موتیع نارد و داوای پارەی لێکرد تا بۆ جیهاد خەرجی بکات. موتیع وتی: خەرجی شەڕکەران لەئەستۆی خۆیانە و بەرژەوەندی موسوڵمانان لەدەستی ئەواندایە. من ئەو کاتە بەم کارە ناچار دەبووم کەجیهان لەژێر فەرمانی مندا بووایە و پارەکان بۆ گەنجینەکانی من ڕەوانە بکرایە، بەڵام ئێستا کەدۆخەکە بەو شێوە نییە، ئەم ئەرکە لەئەستۆی مندا نابێت و ئەنجامدانی لەسەر شانی کەسێکە فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینەکانی لەدەستایە. تەنیا وتار

بەناوی من دەخوێندرێتەوە و ئەگەر خوازیار بن، تەختی خەلافەت بەجێدێڵم.

لەنێوان بەختیارو خەلیفە چەندین پەیك هاتوچۆیان دەکرد و بەختیار هەڕەشەی لەخەلیفە کرد. خەلیفە چوارسەد هەزار درهەمی بۆ نارد. خەلیفە ناچار بوو بۆ دابین کردنی ئەم برە پارە، جل و بەرگ و شوێنە وێرانەکانی ماڵەکەی و بەشێکی دیکە لەشتەکانی بفرۆشێت. ئەم هەواڵە لەنێوان عێراقییەکان و حاجییەکانی خوراسان و خەڵکان بڵاو بوویەوە کەسامانەکانی خەلیفە دەستی بەسەردا گیراوە. بەختیار کاتێك پارەکەی بەدەست گەیشت، بۆ خەرجییەکانی خۆی تەرخانی کرد و بابەتی جیهاد و جیهادییەکان، بوو بەبڵقی سەرئاو.

## بەرێکەوتنی مۆعیزلدین الله ی عەلەوی لەرۆژئاواوە بەرەو میسر

لەم ساڵەدا مۆعیز لدینی عەلەوی لەئەفریقییەوە بەرەو میسر بەرێکەوت. سەرەتای ئەم شوێنگۆرکێ کۆتاییەکانی شەوالی ٣٦١/ ئۆگۆستی ٩٧٢ زایینی بوو. ئەو لەمەنسورییەوە بەرێکەوت و لەسەردانییە ئوردووی لێدا. سەردانییە گوندێك لەنزیك قیروانە. پیاوان، کارگوزاران و بنەماڵەکەی لەم شوێنە پەیوەستی بوون و سامان و کاڵاکان و شتەکانی کۆشکەکانی لێرە کۆکردەوە. دینارەکانیان ئەویان بۆ شمش گۆڕی و هاوشێوەی بەردئاشەکان لەقاڵبیاندا. هەردوو بەردئاشێکیان دەخستە سەر پشتی وشترێك.

مۆعیز لدین لەسەردانییەوە بەرەو میسر بەرێکەوت و پێش ڕۆشتن، یوسف بولکین کوڕی زیری کوڕی مەنادی سەنهاجی حومەیری وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینی ئەفریقییە دیاریکرد بەڵام فەرمانڕەوایەتی سەقەلییە و تەرابولسی رۆژئاوا و سورتی پێنەدا و حەسەن کوڕی عەلی کوڕی باوکی حسەین -ئاماژەی پێدەدرێت- وەك فەرمانڕەوای ئەم ناوچانە دیاریکرد. عەبدوللە کوڕی یەخلەف کەتامی کەلای ئەو پێگەیەکی تایبەتی بوو، وەك فەرمانڕەوای تەرابلوس دەستنیشان کرد و فەرمانی بەزیاد الله کوڕی قودەیمدا ماڵیاتی ئەفریقییە کۆبکاتەوە و عەبدجەباری خوراسانی وەك لێپرسراوی کۆکردنەوەی باج دانا و حسەین کوڕی خەلەف موسەدی کردە هاوڕێی ئەو. فەرمانی بەهەمواندا گوێرایەڵی فەرمانەکانی یوسف کوڕی زیری بن.

ئەو چوار مانگ لەسەردانییە مایەوە تا بەمەبەستەکانی گەیشت. دواتر ملی ڕێگەی گرتەبەر. یوسفی بولکین لەڕێگەدا هاوڕێیەتی دەکرد و موعیز لدین فەرمانی کارەپێویستەکانی پێدەدا. ئێمە گێڕانەوەی تایبەت بەپێشینانی یوسفی بولکین بەئەندازەی پێویست باس دەکەین.

موعیزلدین الله، یوسفی لەنیوەی ڕێگە، بۆ سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی گەڕاندەوە و خۆی لەگەڵ سوپا و کەسانی دەوروبەری هێرشی کردە سەر تەرابلوس. لەم کاتەدا دەستەیەك لەسوپاییەکانی بۆ کوێستانی نەفوسە هەڵاتن. موعیز شوێنیان کەوت بەڵام نەیتوانی بیانگرێت.

دواتر ڕێگەی میسری گرتەبەر و کاتێك محەممەد کوڕی هانی، وتاردەری ئاندۆلۆسی گەیشتە بەرقە، محەممەد کوڕی هانی بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کوژرا و جەنازەی بێ گیانی ئەویان دۆزییەوە کەلای دەریا فڕێدرابوو. کەس نەیزانی کێ ئەوی کوشتووە.

محەممەد کوڕی هانی لەکۆتاییەکانی ڕەجەبی ٣٦٢/ مەی ٩٧٣ زایینی کوژرا. ئەو بەجوانی هۆنراوەی دەهۆنییەوە بەڵام بۆ وەسف کردنی موعیز زێدەڕۆیی کرد و زانا ئایینیەکان (تەکفیریان) کرد و ئەویان بەبێ دین لەقەڵەمدا. ئەمە یەکێك لەهۆنراوەکانی ئەوە:

ما شئت لا ما شاؤت الاقدار          فاحكم فانت الواحد القهار

واتاکەی: خواست، خواستی تۆیە نەك چارەنوس، کەواتە فەرمان بدە چوونکە تۆی تاقانەی سەرکەوتوو.

یا:

و لطال ما          زاحمت حول ركابه جبريلا

زۆرکات لەگەڵ ئەو دەبیتە هاودەمی جبرەئیل.

ئەمەیش یەکێکە لەو هۆنراوانەی بۆ ئەوی دەگێڕنەوە بەڵام من لەدیوانەکەی ئەودا نەمبینی:

حل برقادة المسيح          حل بها آدم و نوح

حل بها الله ذوالمعالى          فكل شیء سواه ريح

واتاکەی: مەسیح و ئادەم و نوح لەرەقادە دابەزین و خواوەندی خاوەنی

گەورەییەکان لەوێ دابەزی و هەر شتێك جگە لەو فیرۆیە.

رەقادە شارێکە لەنزیك قیروان. بەهەرحاڵ هۆنراوەکانی محەممەد کوڕی هانی سنوورەکانی پیاهەڵدان و وەسف کردنی بەزاندووە.

مۆعێز ڕۆشت و لەکۆتاییەکانی شەعبان/ جونی ئەم ساڵە گەیشتە ئەسکەندەرییە. سەران و گەورەکانی میسر پێشوازییان لێکرد. مۆعێز، ڕێزی گرتن وچاکەی لەگەڵ کردن و لەپێنجی رەمەزانی ٣٦٢/ دەی جونی٩٧٣ ڕۆشتە ناو قاهیرە و سوپاکەی لەمیسر و قاهیرە جێگیر بوون و ژمارەیەکی زۆری ئەوان لەخێوەتەکاندا مانەوە.

یوسف کوڕی بولکین دوای ماڵئاوایی لەگەڵ مۆعێز، لەمەنسوورییە مایەوە و کارگوزارەکانی بۆ سنوورەکان ڕەوانە کرد. دواتر خۆی بەرەو سەرزەمینەکان بەرێکەوت تا لەنزیکەوە سەرپەرەشتی کاروبارەکان بکات و دادپەروەری لەناو خەڵکان بڵاو بکاتەوە. خەڵکانی باغایە دژی کارگوزارەکەی خۆیان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و رووبەرووی بوونەوە و بەهەڵاتن ناچاریان کرد. یوسف سوپایەکی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. کارگوزارەکەی یوسف، لەرووداوەکان ئاگاداری کردەوە. یوسف سوپای رازاندەوە و سەربازەکانی بۆ جەنگ لەو سەرزەمینە کۆکردەوە بەڵام لەم کاتەدا هەواڵی پێگەیشت کەخەڵکانی تاهەرت شۆڕشیان دەستپێکردووە و شمشێری ناسازگارییان دەرکێشاوە و کارگوزارەکەیان لەشارەکە دەرپەڕاندووە. یوسف ڕێگەی تاهەرتی گرتەبەر و رووبەروویان بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و شارەکەی وێران کرد. لەو شارە ئاگادار بوویەوە خەڵکانی زەناتە لەتێلمێسان دابەزیون. یوسف هێرشی کردەسەریان و ئەوان هەڵاتن. یوسف چەند رۆژێك لەتێلمێسان مایەوە و گەمارۆی خستەسەر. خەڵکەکەی، ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکان نیشاندا و یوسف، لێیان خۆش بوو. دانیشتووانی ئەو شارەی بۆ ئەشیر ڕەوانە کرد و ئەوان لەوێ بناغەی شارێکیان دارشت و ناویاننا تێلمێسانە.

دواتر لەنێوان زیادە الله کوڕی قودەیم و کارگوزارەکەی هاوڕێی بەناوی عەبدوللە کوڕی محەممەدی کاتب، ناسازگاری هاتە ئاراوە و دەستیان بۆ شمشێر برد و ژمارەیەك لەدەوری هەرکام لەوان کۆبوویەوە. چەندین جەنگ لەنێوان ئەوان روویدا. یوسفی بولکین زیاتر خوازیاری سەرکەوتنی عەبدوللە بوو. دواتر باوکی عەبدوللە

کوڕی قودەیمی گرت و زیندانی کرد. کوڕی قودەیم لەزیندان مایەوە تا ئەو کاتەی مۆعیز لەمیسر مرد و پێگەی یوسف کوڕی بولکین بەرز بوویەوە.

لەساڵی ٩٧٤/٣٦٤ زایینی خەلەف کوڕی حسەین لەقەڵایەکی بەرز دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەبەربەرەکان وکەسانی دیکە لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو لەهاوڕێ کۆنەکانی کوڕی قودەیم بوو. یوسف لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و هێرشی کردە سەر قەڵاکەی و بۆ جەنگی ئەو ریزی بەست. لەهەر دوو سوپا ژمارەیەکی زۆر کوژران. سەرئەنجام یوسف دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت و خەلەف کوڕی حسەین هەڵات. ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانی ئەم قەڵایە لەناو خوێنی خۆیاندا گەوزان. یوسف، سەری حەوت هەزار کەس لەدانیشتووانی قەڵاکەی بۆ قیروان نارد. دواتر خەلەفی گرت و فەرمانیدا سوار لەسەر وشتر بیگەڕێنن. دواتر لەدارياندا و سەری بڕاوی ئەویان بۆ میسر نارد. کاتێك خەڵکانی باغایە لەم پێشهاتە ئاگادار بوونەوە، ترسان و ڕێگەی ئاشتییان لەگەڵ یوسف گرتەبەر و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا. یوسف ئەوانی لەباغایە دوور کردەوە و دیواری شارەکەی وێران کرد.

## یوسف بولکین کوڕی زیری کوڕی مەناد و بنەماڵەکەی

ناوی ئەو یوسف بولکین کوڕی زیری کوڕی مەنادی سەنهاجی حومەیرییە. پێش ئەوەی مەنسور بڕواتە مەغریب سەنهاجییەکان و شوێنکەوتەکانی لەو سەرزەمینە ملکەچی فەرمانەکانی بوون. باوکی ئەو، مەناد، گەورەی خەڵکەکەی بوو. خاوەنی سامان و چەندین منداڵ بوو. ڕێزی لەمیوانەکان دەگرت. ئەو لەڕۆژگاری خۆی، زیری کوڕی پێش منداڵەکانی دیکەی دەخست. سەرکردایەتی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی سەنهاجەی لەئەستۆدابوو و لەگەڵ ئەوان سەرقاڵی تالانی و ئەسیر کردنی خەڵکان بوو. زەناتییەکان ڕژدییان پێبردن و هێزیان کۆکردەوە تا هێرش بکەنە سەر زیری و لەناوی ببەن. بۆ ئەم مەبەستە بەپەلە هێرشیان کردەسەر و شەوانە و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕووبەڕوویان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و سامانەکانیان تالان کرد. شوێنکەوتەکانی زیری زیادی کرد وبۆ دابین کردنی نیازەکانیان ڕووبەڕوی کێشە و گرفت بوونەوە. پێشنیاریان بەزیری کرد ئەوان بۆ

سەرزەمینێکی دیکە ببات. زیری ئەوانی بۆ شوێنێك لەشاری ئەشیر ڕەوانە کرد. ئەو لەوێ سەرچاوەی ئاوی زۆری بینی و پەسەندی کرد و بناغەی شاری ئەشیری لەوێ دارشت و خۆی و هاوەڵانی لەوێ مانەوە. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٩٧٤/٣٦٤ زایینی بوو.

زەناتییەکان لەو دیارە خراپەکارییان دەکرد و کاتێك هێرشیان دەکرایەسەر، پەنایان بۆ دەشت و چیاکان دەبرد. کاتێك شاری ئەشیر دروست کرا، سەنهاجییەکان لەنێوان زەناتییەکان و بەربەرییەکان جێگیر بوون. قائیم ڕەزامەندی خۆی نیشاندا.

زیری لەخراپەکاری زەناتییەکان ئاگادار بوویەوە و بیستی کارە ناڕەواکان بەڕەوا دەزانن و ئەوەی پێغەمبەرێك لەناو ئەوان دەرکەوتووە. هێرشی کردەسەریان و لەناوی بردن. ئەو کەسەی بانگەشەی پێغەمبەری دەکرد، گرتی و بردییە بارەگای فەقیهەکان و لەبەر چاوی ئەوان کوشتی.

زیری لەکاتی شۆڕشی باوکی یەزید، ناو و نیشانێکی جوانی لەخۆی بەجێهێشت و خواردەمەنی گەیاندە قائیم لەمەهدییە و لای ئەو پێگەی بەرز بوویەوە.

دواتر زەناتییەکان گەمارۆیان خستە سەر ئەشیر. زیری سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە. لەنێوان دوو سوپا چەندین جەنگ ڕوویدا و ژمارەیەکی فراوان لەهەردوولا کوژران. سەرئەنجام زیری سەرکەوت و سامانی زەناتییەکانی تاڵان کرد.

ماوەیەك دواتر پیاوێك لەچیای ئەوراس دژی مەنسور ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ژمارەیەك لەدەوری کۆبوونەوە. ئەویان بەسەعید کوڕی یوسف ناو دەبرد. زیری، کوڕەکەی، بولکینی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. بولکین لەباغایە ڕووبەڕووی بوویەوە و دوو سوپا ریزیان بەست و ئاگری جەنگیان هەڵگیرساند. لەکۆتایی جەنگەکە، سەعیدی خارجی و شوێنکەوتەکانی لەهەوارە و کەسانی دیکە کوژران. بەم شێوەیە پێگەی ئەو لای مەنسور بەرز بوویەوە. ئەو -وەك ئامارژەمان پێدا- لەگرتنی فاس دەورێکی شیاوی بوو.

دواتر بولکین کوڕی زیری مەبەستی محەممەد کوڕی حسەین کوڕی خزری زەناتی کرد کەدژی مۆعیز ئاڵای شۆڕشی بەرز کردبوویەوە. ژمارەیەکی زۆر لەدەوری محەممەد کۆببوونەوە و پێگەی ئەویان بەرز کردەوە. یوسف کوڕی بولکین سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ژمارەیەکی بەرچاو لەشوێنکەوتەکانی کوشت. مۆعیز

شادمان بوو چوونکە دەیخواست، لەبەر توانایییەکانی یوسف کوڕی بولکین، فەرمانڕەوایی هەموو ڕۆژئاوایی پێببەخشێت بەڵام لەوە دەترسا دوای ڕۆشتنی خۆی بۆ میسر، یوسف دەست بەسەر هەموو ئەو سەرزەمینەدا بگرێت. کاتێك لێڵ بوونی نێوان یوسف و زەناتییەکان پەرەی سەند، مۆعێز لەئەندێشەی یوسف بۆ زاڵ بوون بەسەر سەرزەمینەکەی ئاسوودە بوو.

لەنێوان جەعفەر کوڕی عەلی، فەرمانڕەوای شاری مەسیلە و زاب، و زیری دوژمنایەتی هاتبووە ئاراوە. کاتێك پێگەی زیری لای مۆعێز بەرز بوویەوە، جەعفەر پەسەندی نەکرد و لەبەر ئەمە سەرزەمینەکەی خۆی بەجێهێشت و پەیوەستی خەڵکانی زەناتە بوو. ئەوان بەخۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێکرد و لەبەر دوژمنایەتی لەگەڵ زیری، وەك سەرۆکی خۆیان هەڵیانبژارد. جەعفەر دژی مۆعێز ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. زیری لەگەڵ ژمارەیەك لەخەڵکانی سەنهاجە و کەسانی دیکە هێرشی کردەسەر و لەرەمەزان/ جون، جەنگ دەستی پێکرد. لەم کاتەدا ئەسپەکەی زیری، ئەوی خستە خوار و مرد. جەعفەر گومانی کرد زەناتییەکان لەمەرگی زیری پەشیمان بوونەتەوە و مەبەستی نافەرمانییان لەسەردایە، پێی وتن: کوڕی جەعفەر، یوسفی بولکین، چاوپۆشی لەخوێنی باوکی ناکات و تەنیا بەکوشتنی بکوژی باوکی بەسەندە ناکات. باشتر وایە لەچیا وکوێستانە بڵندەکان پەنا بگرین. هاوەڵانی بەوتەکانی رازی بوون و ئەو سامان وکەسانی خۆی خستە سەر پشتی چوارپێکان و ڕەوانەی کردن و خۆی لەگەڵ زەناتییەکان مایەوە. بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی فەرمانی بەکۆیلەکانی خۆیدا لەناو کاروانەکە ئاژاوەیەك بنێنەوە. کۆیلەکان ئەو کارەیان کرد و ئەو لەدوورەوە سەیری دەکرد. بەزەناتییەکانی وت: بابزانم ئەم شۆڕش و ئاژاوە بۆ چییە، و خۆی گەیاندە کاروانەکە و لەدەست زەناتییەکان خۆی رزگار کرد و ڕۆشتە لای فەرمانڕەوای ئومەوییەکان لەئاندۆلۆس. فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس ڕێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. زەناتییەکان پەشیمان بوونەوە بۆچی پێشتر نەیانکوشت و سامانەکەیان تاڵان نەکرد.

لەم کاتەدا یوسفی بولکین هێزێکی زۆری کۆکردەوە و بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی هێرشی کردە سەر زەناتییەکان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. ژنەکانی ئەسیر کرد و منداڵەکانی وەك تاڵانی لەگەڵ خۆی برد و فەرمانیدا قازان بخەنە سەر سەریان و

خواردن دروست بکەن. موعیز بەم هەواڵە شادمان و مەسیلە و کەنارەکانی پەیوەستی فەرمانڕەوایەتی یوسف بولکین کرد. یوسف پێگەی بەرز بوویەوە. پاشماوەی بەسەرهاتی ئەو کاتێك باس دەکەین کەفەرمانڕەوایەتی ئەفریقیە بگرێتەدەست.

## ئاشتی لەنێوان ئەمیر مەنسور کوڕی نوح و ڕۆکن ئەلدەولە و عیزەد ئەلدەولە

لەم ساڵەدا لەنێوان ئەمیر مەنسور کوڕی نوحی سامانی، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهر لەلایەك و ڕۆکن ئەلدەولە و کوڕەکەی عیزەد ئەلدەولە لەلایەکی دیکە بەو مەرجە پەیمانی ئاشتی واژۆ کرا کەڕۆکن ئەلدەولە و عیزەد ئەلدەولە، ساڵانە سەد و پەنجا هەزار دینار بۆ ئەمیر نوح ڕەوانە بکەن. نوح لەگەڵ کچی عیزەد ئەلدەولە پەیوەندی هاوسەرگیری بەست و چەندین دیاری گرانبایی بۆ عیزەد ئەلدەولە نارد کەهاوشێوە و هاوتای نەبینراوە و نەبیستراوە. پەیمانی ئاشتی لەنێوان ئەوان نووسرا و گەورەکانی خوراسان، فارس و عیراق وەك شایەت پەیمان نامەکەیان واژۆ کرد.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی سیمجور، فەرمانـدەی سوپای خوراسان، کەنێردراوی ئەمیر مەنسور بوو، ئەم ئاشتییەی ڕێکخست.

بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەسەفەر/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی گەورە کەوتەخوار. ڕووناکییەکی گەورەی لێ بینرا و لەکاتی کەوتنەخوار دەنگێکی هاوشێوەی هەورەگرمەی لێ بیسترا.

لەشەوال/ جولای ئەم ساڵە باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان دەستی بەسەر قەڵای ماردیندا گرت. جێگری براکەی ئەم قەڵایەی پێسپارد. باوکی تەغلەب، هەموو سامانی براکەی، لەحەرەمسەرا و سامان وکەل و پەل وکەرەستەکانی جەنگی هەڵگرت وبۆ موسڵی گواستەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و دووی کۆچی ( ٩٧٢و٩٧٣ زایینی )

## شکستی ڕۆمییەکان و ئەسیر کرانی دوموستوق

لەم سالەدا لەنێوان هیبەت الله کوڕی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان و دوموستوق لەمەیافارقین جەنگ ڕوویدا.

چۆنیەتییەکەی وەك ئامارژەمان پێدا ئەوە بوو دوموستوق جەنگی لەسەرزەمینە ئیسلامییەکان دەست پێکرد و دیاری بەکر و ڕەبیعەی تالأن کرد و لەبەر ئەوەی کەس ڕووبەرووی نەبوویەوە، تەماحکار وبڕیاریدا دەست بەسەر ئامەدیش (دیاربەکر) بگرێت. بۆ ئەمە مەبەستە بەرەو شارەکە بەرێکەوت. دیاربەکر لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی هەزار مەرد، کۆیلەی باوکی هەیجا کوڕی حەمدان دابوو. هەزار مەرد نامەیەکی بۆ باوکی تەغلەب نووسی و داوای هاوکاری لێکرد و ئەوی لەبارودۆخی خۆی ئاگادار کردەوە. باوکی تەغلەب، براکەی، باوکی قاسم هیبەت الله کوڕی ناسر ئەلدەولەی بەرەو ئامەد ڕەوانە کرد و باوکی هەیجا لەگەڵ باوکی قاسم، هەردووك بۆ جەنگ دژی دوموستوق بڕیار و پەیمانیاندا و هێرشیان کردەسەر و لەکۆتایی ڕەمەزان/ پێنجی جولای لەبەرابەر ئەو ڕیزیان بەست. ژمارەی سوپاکەی دوموستوق فراوان بوو بەلأم هەزار مەرد و باوکی قاسم لەتەنگەیەك گرفتارییان کرد تا ئەو جێگەی ئەسپەکان توانای جموجۆڵیان نەما. ڕۆمییەکان کەبۆ ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە ئامادە نەبوون، هەلأتن. موسوڵمانان دوموستوقیان گرت و ئەو لەزیندان مایەوە تا لەساڵی ٩٧٣/٣٦٣ زایینی نەخۆش کەوت. باوکی تەغلەب بۆ چارەسەر کردنی هەوڵی زۆریدا و هەموو پزیشکەکانی کۆکردەوە بەلأم سوودی نەبوو و دوموستوق مرد.

## ئاگرکەوتنەوە لەکەرخ

لەشەعبان/ مەی ئەم ساڵە ئاگرێکی گەورە کەرخی سووتاند. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: دەستاق بان، پیاوێکی کوشت و خەڵکان و تورکەکان دەنگی نارەزاییەتیان بەرز کردەوە. دەستاق بان هەڵات و خۆی خستە ناو ماڵی یەکێك لەتورکەکان. خەڵکان ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر و کوشتیان و جەنازەکەیان سووتاند و دەرگای زیندانی (دەستاقخانە)یان کردەوە و زیندانییەکانیان رزگار کرد. باوکی فەزڵ بۆ گرتنی خراپەکاران سوار ئەسپ بوو و پەردەدارێکی بەناوی ساف بۆ جەنگی خەڵکی گەڕەك و کۆڵانەکانی کەرخ نارد. ساقی بۆ بەجێهێنانی سوونەت سەختگیر بوو. لەبەر ئەمە ئاگرێکی ئەوتۆی لەکەرخ هەڵگیرساند کەحەڤدە هەزار کەس سووتان و سێسەد و ژمارەیەکی زۆر لەماڵەکان و سی و سێ مزگەوت و سامانێکی زۆر لەم ئاگرەدا گڕیان گرت.

## لابردنی باوکی فەزڵ لەوەزارەتی عێزەد ئەلدەولە و وەزارەتی کوڕی بەقیە

لەزیحەججە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە باوکی فەزڵ عەباس کوڕی حسەین لەوەزارەتی بەختیار لابرا و محەممەد کوڕی بەقیە جێگەی گرتەوە. خەڵکان لەم کارە سەریان سووڕما چوونکە محەممەد خاوەنی هیچ پێگەیەك نەبوو. ئەو لەئەوانا ژیانی بەسەردەبرد و باوکی وەرزێر بوو بەڵام خۆی یەکێك لەکەسە نزیکەکانی بەختیار لەقەڵەم دەدرا و کاروباری تایبەت بەچێشتخانەی ئەوی هەڵدەسوڕاند.

باوکی فەزڵی وەزیر زیندانی کرا و ماوەیەك دواتر مرد. دەستەیەك دەڵێن ژەهر خواردیان کرد.

لەکاتی وەزارەتی ئەو کاروبارە ئایینییەکان بەفیڕۆچوون کەسووتاندنی گەڕەکی کەرخ یەکێك لەکارە خراپەکانی ئەو بوو کەژمارەیەکی زۆری خەڵکان و کەل و پەلەکان لەناوچوون. هەروەها ئەوکەسێکی ستەمکار بوو و سامانی کەسەکانی زەوت دەکرد و بۆ تەندروستی خۆی لەناو سوپاییەکان بڵاوی دەکردەوە بەڵام

خواوەند بەڵای خۆی بەسەردا باراند و چەندە راستی وت پێغەمبەری خوا ئەو کاتەی فەرمووی: ((هەرکەس رەزامەندی خەڵکان بەبەهای تورە بوونی خواوەند بەدەست بێنێت، خواوەند لێی تورە دەبێت و خەڵکان لەو تورە دەکات.))

کردەوەکانی ئەو (لەلەناوچوونی) ئاشکراتر لەو تۆمەتانە بوو دوژمنەکانی بۆیان هەڵدەبەست، ئەو دوژمنانەی بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی ئەو لەدین زێدەرۆیی و ستەمیان لەخەڵکان دەکرد. دوای ئەوەی خۆی و دەبیر و پەردەدارەکەیان زیندانی کرد، هاوسەرەکەی مرد و ماڵەکەی وێران و شوێنەواری سڕایەوە. پەنا دەبەینە بەر بارەگای خواوەند لەم چارەنووسە کارەساتبارە. لەخوا دەپارێینەوە دەرئەنجامێکی باشمان پێببەخشێت چوونکە هەموو شتەکانی ئەم جیهانە زیان بەخشە.

لەلایەکی دیکە، کاروبارەکان بۆ کوڕی بەقیە سەقامگیر بوو و بارودۆخی لەبەر زەوت کردنی سامانی باوکی فەزلْ و هاوەڵانی، بەرەو باش بوون دەڕۆشت بەڵام کاتێك سامانی ئەویش کۆتایی پێهات، ستەمکاری کردە پیشە. کەنارەکانی وێران کرد و خراپەکاران دەرکەوتن و ئەوەی دەیانویست، ئەنجامیاندا و ناسازگاری لەنێوان بەختیار و تورکەکان تەشەنەی سەند و کوڕی بەقیە هەوڵیدا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ بەختیار و سەبوکتەکین بپارێزێت. هەموویان پەیمانی ئاشتییان بەست بەڵام ئەم پەیمانە، خۆڵەمێشی ژێر ئاگر بوو. سەبوکتەکین لەگەڵ تورکەکان ڕۆشتە لای بەختیار و پەیمانی لەگەڵ بەست و بارودۆخ بۆ دۆخی پێشوو گەڕایەوە. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: سەرخۆشێکی دەیلەمی لای ماڵی سەبوکتەکین گوزەری کرد و ڕمەکەی دەستی هاویشت و لەدیواری ماڵەکە چەقی. سەبوکتەکین بەمەی زانی و فەرمانی بەکۆیلەکانیدا و ئەو پیاوەیان گرت. سەبوکتەکین گومانی کرد پیلانی کوشتنیان داڕشتووە. لێپێچینەوەی لەو پیاوە کرد بەڵام ئەو هیچ شتێکی نەوت و بەم شێوەیە ئەوی بۆ لای بەختیار نارد و لەڕووداوەکە ئاگاداری کردەوە. بەختیار فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد و لەم کاتەدا سەبوکتەکین بەهێز بوو لەبەر ئەوەی بەختیار مەبەستی کوشتنی ئەوی بووە و بۆیە ئەو پیاوەی کوشت تا ئەم پیلانە بۆ کەس ئاشکرا نەبێت. ئەو دەیلەمییەکانی بۆ کوشتنی بەختیار هاندا و بەکەرەستەی جەنگ

تەیاری کردن. بەڵام بەختیار توانی ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بێنێت و بەمشێوەیە چاویان لەکوشتنی پۆشی.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەزیحەججە/ سێپتامبەری ئەم ساڵە بەختیار، شەریف باوکی ئەحمەدی موسەوی، باوکی سەیید ڕەزی و سەیید مورتەزای لەگەڵ نامەیەك بۆلای باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان لەموسڵ ڕەوانە کرد. شەریف ڕۆشتە لای باوکی تەغلەب و لەموحەرەمی ٣٦٣/ ئۆکتۆبەری ٩٧٣ زایینی گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا باوکی عەباس محەممەد کوڕی حەسەن کوڕی سەعیدی مەخرەمی سۆفی، هاوڕێی شیبلی، لەمەککە کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و سێی کۆچی (٩٧٣ زایینی)

## زاڵبوونی بەختیار لەموسڵ و دەرئە نجامەکەی

لەرەبیع الاوەل/ دێسامبەری ئەم ساڵە، بەختیار هێرشی کردە سەر موسڵ تا فەرمانڕەوایەتی ئەو شارە و هەموو سنورەکانی باوکی تەغلەب بگرێتەدەست.

هۆکارەکەی -وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا- ڕۆشتنی حەمدان کوڕی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان و ئیبراهیمی برای بۆ لای بەختیار و هاوکاری ویستنی ئەم دووانە لەبەختیار و سکالاّی ئەوان لەبراکەیان، باوکی تەغلەب بوو. بەختیار بەڵێنی هاوکاری پێدان بۆ ئەوەی سەرزەمینەکان و سامانەکان لەدەستی باوکی تەغلەب دەربێنێت وتۆڵەی ئەو دووانە وەربگرێت. دواتر بەختیار سەرقاڵی ڕووداوی بوتەیحە وشوێنەکانی دیکە بوو و کاتێك کۆتایی بەکێشەکانی هێنا، حەمدان و ئیبراهیم وتەکانی خۆیان دووبارە کردەوە. حەمدان بڕە پارەیەکی فراوانی خستە بەردەستی بەختیار و کاروبار و پێگەی باوکی تەغلەبی بەسووك لەقەڵەمدا و داوای لەبەختیار کرد سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو پەیوەست بەسنوورەکانی خۆی بکات تا لەژێر فەرمانی ئەودا بێت و سامانەکانی ئەو دیارە لەگەنجینەکانی کۆ ببێتەوە و بەناوی خەلیفە وتار بخوێندرێتەوە.

باوکی فەزڵی وەزیر ڕەزامەندی بۆ ئەم کارە نیشاندا و پەسەندی کرد. چوونکە پێشتر، خۆی گومانی دەکرد پارەکانی دەستی زیاد دەکات و جڵەوی کاروبارەکانی لەدەستا دەبێت. ماوەیەك دواتر ئیبراهیم کوڕی ناسر ئەلدەولە لای بەختیار هەڵات و بۆ لای باوکی تەغلەبی برای گەڕایەوە و بەم شێوەیە بەختیار بۆ هێرش کردنە سەر موسڵ بڕیاریدا. لەم کاتەدا باوکی فەزڵی لەوەزارەت دوورخستەوە و کوڕی بەقیەی وەك وەزیر دەستنیشان کرد. باوکی تەغلەب نامەیەکی بۆ کوڕی بەقیە نووسی. کوڕی بەقیە بەختیاری بۆ هێرش کردنە سەر موسڵ هاندا. بەختیار لەبەغدادەوە ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و لەنۆزدەی ڕەبیع الاخر/ هەژدەی ژانویە گەیشتە ئەو شارە و لەدێری ئەعلا ئوردووی لێدا.

کاتێك بەختیار لەموسڵ نزیك کەوتەوە، باوکی تەغلب شارەکەی بەجێهێشت و رووی کردە سنجار. عەرەبەکانی شکاند و خواردەمەنی لەموسڵ نەهێشت و سەرپەرەستی دیوانەکانی لەگەڵ خۆی برد و لەسنجارەوە بەرەو بەغداد بەرێکەوت بەڵام لەرێگەدا نەك هەر رێگەی لەکەس نەگرت بەڵکو نیاز و پێداویستییەکانی خۆی و هاوەڵانی بەبەرزترین نرخەکان دەکڕی. بەختیار کاتێك ئەم هەواڵەی بیست، کوڕی بەقیهی وەزیر و سەبوکتەکینی بۆ بەغداد گەڕاندەوە. کوڕی بەقیە رۆشتە بەغداد و سەبوکتەکین لەحەربی مایەوە. باوکی تەغلەب لەبەغداد نزیك کەوتبوویەوە. لەم کاتەدا خراپەکارانی بەغداد لەبەشی رۆژئاوا ئاژاوەیان نابوویەوە و لەنێوان سوونی و شیعەکان جەنگێکی گەورە هەڵگیرسابوو. بەقاڵەکان کەسوونی بوون، ژنێکیان سوار وشترێك کردبوو و بەعایشە ناویان دەبرد و دەستەیەك خۆیان بەتەڵحە و زوبەیر دەناساند و رووبەرووی شیعەکان بوونەوە. ئەوان هاواریان دەکرد: ئێمە لەگەڵ شوێنکەوتەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەجەنگین و لەم قسانە.

بەشی رۆژهەڵاتی بەغداد ئارام و لەبەشی رۆژئاوا ئاژاوە سەری هەڵدابوو. ژمارەیەك لەسەرکردەی خراپەکاران گیران وکوژران و خەڵك کەمێك ئارام بوونەوە. کاتێك باوکی تەغلەب ئاگادار بوویەوە کوڕی بەقیە رۆشتۆتە ناو بەغداد و سەبوکتەکین لەحەرب ئوردووی لێداوە، لەبەغداد گەڕایەوە و لەنزیك شارەکە ئوردووی لێدا. لەنێوان ئەوان چەندین جەنگی بچووك روویدا. دواتر بەنهێنی بڕیاریاندا وا نیشان بدەن ناسازگاری لەنێوان ئەوان فەرمانڕەوایە تا بەم شێوەیە بتوانن خەلیفە، وەزیر، دایك و بنەماڵەی بەختیار بگرن و ئەگەر بتوانن ئەو کارە بکەن، سەبوکتەکین دەڕواتە بەغداد و باوکی تەغلەب بۆ موسڵ دەگەڕێتەوە و ئەوەی دەخوازێت لەبەختیاری بەدەست دێنێت و دەسەڵاتەکەی دەخاتە ژێر دەستی خۆی.

لەم کاتەدا سەبوکتەکین لەدەرئەنجامەکانی ئەم کارە ترسا و لەشوێنەکەی خۆی مایەوە و کوڕی بەقیە پەیوەستی بوو. ئەم پەیمانە هەڵوەشایەوە و بەمەبەستی ئاشتی نامەیان بۆ باوکی تەغلەب نووسی و بڕیاردرا باوکی تەغلەب

فەرمانڕەوایەتی سنوورەکەی خۆی بکات و بۆ خەرجی ئەم سەفەرەی بەختیار، سێ هەزار کوڕ دانەوێڵەی پێبدات و زەوییەکانی حەمدانی برای-جگە لەماردین- بۆ ئەو بگەڕێنێتەوە.

کاتێک ئەم پەیمانەیان بەست، نامەیەکیان بۆ بەختیار نووسی تا موسڵ بەجێبێڵێت بۆ ئەوەی باوکی تەغلەب بۆ ئەو شارە بگەڕێتەوە. سەبوکتەکین ڕۆشتە ناو بەغداد. بەختیار ڕەزامەندی بۆ ئەم پەیمانە نیشاندا. کاتێک بەختیار لەنزیک بوونەوەی باوکی تەغلەب ئاگادار بوویەوە، ترسا چوونکە بەشی زۆری سوپاکەی لەگەڵ سەبوکتەکین گەڕابوونەوە. لەبەر ئەمە کوڕی بەقیە داوای لەسەبوکتەکین کرد بڕواتە لای بەختیار. سەبوکتەکین ئەم فەرمانەی پێ ناخۆش بوو بەڵام کاتێک بیری لەدەرئەنجامەکانی کردەوە، بەناڕەزامەندییەوە ملی ڕێگەی گرتەبەر. ناڕەزامەندی ئەو لای خەڵکان ئاشکرا بوو.

بەختیار، لەدێری ئەعلا بوو. سوپاکەی کۆکردەوە و باوکی تەغلەب لەحەسبا، لەخوارەوەی موسڵ، ئوردووی لێدا. لەنێوان ئەم دوو شوێنە دووری یەك شار جێگیر بوو. خەڵکانی موسڵ خوازیاری باوکی تەغلەب بوون و لەبەر ئەوەی بەختیار دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرتبوو، خۆشەویستی خۆیان بۆ باوکی تەغلەب ئاشکرا کرد. بەهەرحاڵ خەڵکان لەنێوان ئەم دووانە بوونە نێوەنجیگەر و ئاڵای ئاشتییان لەناو ئەواندا بەرز کردەوە. باوکی تەغلەب داوای لەبەختیار کرد نازناوی سوڵتانی پێبدات و هاوسەرەکەی، کچی بەختیار، بگەڕێنێتەوە (پێشتر وتمان کچەکەی لەتەمەنی سێ ساڵ لەباوکی تەغلەب مارە بڕا) و لەپەیمانەکەی چاو بپۆشێت. بەختیار لەترسا ڕەزامەندی بۆ هەموو خواستەکانی نیشاندا. پەیمانیان بەست و بەختیار بەرەو بەغداد گەڕایەوە و خەڵکانی موسڵ لەڕۆشتنی ئەو شادمان بوون چوونکە بەختیار ستەمی لێکردن.

کاتێك بەختیار گەیشتە کوحەیل، ئاگادار بوویەوە باوکی تەغلەب دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەوی کوشتووە. بەختیار ئەمانی پێبەخشیبوون. ئەم دەستەیە بۆ موسڵ گەڕابوونەوە تا سامان و ماڵ و مناڵی خۆیان هەڵگرن بەڵام باوکی تەغلەب ئەوانی گرت و کوشتی. بەختیار ئەم هەواڵەی پێ ناخۆش بوو. لەشوێنەکەی

مایەوە و فەرمانی بەکوڕی بەقیە و سەبوکتەکیندا بەرەو موسڵ بەرێکەون. ئەو پێشتر پەیکی بۆ لای ئەوان نارد تا لەشوێنی خۆیان بمێننەوە چوونکە ئاشتی سەقامگیر کرابوو و کاتێك پەیکی بەدوای ئەوان نارد، هەموان بەرەو موسڵ بەرێکەوتن و لەکۆتاییەکانی جومادی الاخرە/ رۆژەکانی کۆتایی ژانویە لەدێری ئەعلا دابەزین. باوکی تەغلەب بەرەو تەل یەعفەر (تەلەعفەر) هەلات. بەختیار ویستی شوێنپێی هەڵبگرێت. باوکی تەغلەب، دەبیر وهاورێکەی خۆی باوکی حەسەن عەلی کوڕی باوکی عەمرۆی بۆ لای بەختیار نارد بەلآم بەختیار ئەوی لەگەڵ باوکی حەسەن کوڕی عەرس و باوکی ئەحمەد کوڕی حەوقل گرت.

نامەیان بۆ یەك نووسی و باوکی تەغلەب سوێندی خوارد لەکوژرانی ئەو دەستەیە ئاگادار نەبووە. دووبارە ئاشتی گەڕایەوە و سێبەری بەسەر ئەو دووانەدا بلآو کردەوە. باوکی تەغلەب ئەو بڕە پارەی بەڵێنیدا بوو، بۆ بەختیاری نارد و بەختیار، شەریف باوکی ئەحمەدی موسەوی و قازی ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەبدولرەحمانی بۆ لای باوکی تەغلەب نارد و ئەو دوانە باوکی تەغلەبیان سوێنددا. دووبارە پەیمانی ئاشتی سەقامگیر کرا و بەختیار لەحەڤدەی رەجەب/ پانزەی ئاوریل لەموسڵ گەڕایەوە و باوکی تەغلەب بەرەو موسڵ بەرێکەوت.

کاتێك بەختیار لەموسڵ گەڕایەوە، جیازی بۆ کچەکەی ئامادە کرد و بۆ لای هاوسەرەکەی، باوکی تەغلەبی نارد. کچی بەختیار لای باوکی تەغلەب مایەوە، تا لێی سەندرایەوە و چیتر ناوی نەهاتە ناو ناوان.

## دەرکەوتنی ناسازگاری لەنێوان بەختیار و هاوەڵانی

لەم ساڵەدا ناسازگاری لەنێوان تورك و دەیلەمییەکان لەئەهواز دەستی پێکرد و عێراقی گرتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: سامانی بەختیار کەمی کرد و بیانووی سوپاکەی زیاد. چیتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبوون و ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە. بڕیاردان بۆ بەختیار دژوار بوو. دیوانەکان و وەزیرەکەی هیچ رێگەچارەیەکیان دەست نەکەوت و لەبەر ئەمە بەرەو موسڵ بەرێکەوتن بەلآم لەوێش هیچیان

دەستنەکەوت. بەباشیان زانی بەرەو ئەهواز بڕۆن و خۆیان بخەنە سەرشانی بەختەکین ئازادرووییە کەفەرمانڕەوای ئەو ناوچە بوو. ئەوان دەیانویست بیانوێک بدۆزنەوە بۆ ئەوەی پارە لەبەختەکین و کەسانی دیکە بستێنن.

بەختیار و سوپاکەی بەڕێکەوتن. ئەو سەبوکتەکینی تورکی وەک نوێنەری خۆی بەجێهێشت. کاتێک گەیشتنە ئەهواز، بەختەکین خزمەتی کرد و سامانێکی زۆری خستە بەردەست و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نیشاندا. بەختیار بیری لەڕێگەیەک دەکردەوە تا بتوانێت بیگرێت.

بەرێکەوت لەناو تورک و دەیلەمییەکان ئاژاوە سەریهەڵدا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: یەکێک لەدەیلەمییەکان لەماڵێک لەئەهواز دابەزی و تورکێکیش لەماڵێکی نزیک ئەو نیشتەجێ بوو. چەند خشتێک لەوێ دەبینرا. کۆیلەی پیاوی دەیلەمی ویستی بەم خشتانە ئاخوڕێک بۆ ئەسپەکەی دروست بکات بەڵام کۆیلەی تورکەکە ڕێگەی لێگرت و کەوتنە گیانی یەک. پیاوی دەیلەمی و تورک هەرکام بەرگرییان لەکۆیلەکانیان دەکرد. تورکەکە لەبەرابەر دەیلەمییەکە ناتەوان بوو. سوار ئەسپەکەی بوو و بۆ وەرگرتنی هاوکاری ڕۆشتە لای تورکەکان. تورکەکان سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون و دەیلەمییەکانیش. هەردوولا دەستیان بۆ شمشێر برد و لەم جەنگەدا ژمارەیەک لەسەرکردە تورکەکان کوژران. تورکەکان دەیانویست تۆڵەی ئەوان بکەنەوە و لەبەر ئەمە سەرکردەیەکی دەیلەمییان کوشت و شارەکەیان بەجێهێشت.

بەختیار هەوڵیدا ئەم ئاژاوەیە دامرکێنێتەوە بەڵام نەیتوانی. لەگەڵ دەیلەمییەکان راوێژی کرد. بەختیار بەهەر وتەیەک رازی دەبوو. دەیلەمییەکان بۆچوونیان وابوو ئەو سەرکردە تورکەکان بگرێت تا ڕەزامەندی خەڵکی شارەکە بەدەست بێنێت. بەختیار، ئازادرووییە و دەبیرەکەی سەهل کوڕی بیشر و سەباشی خوارەزمی بەکتیجوری -لەخزمەکاتی سەبوکتەکین- بانگ کرد. ئەوان هاتن و بەختیار ئەوانی گرت و زیندانی کردن و دەستی دەیلەمییەکانی بۆ سەرتورکەکان ئاوەڵا کرد. دەیلەمییەکان سامان و چوارپێکانی ئەوانیان تالان کرد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. تورکەکان هەڵاتن و بەختیار دەستی بەسەر زەوی و

سامانەکانی سەبوکتەکین گرت و فەرمانیدا لەبەسرە جاڕ بدەن کوشتنی تورکەکان ڕەوایە.

## دەرئەنجامی فریوەکەی بەختیار

بەختیار لەگەڵ دایك و خوشکەکانی پیلانیان داڕشتبوو هەرکات فەرمانی گرتنی تورکەکانی بۆ نووسین وا نیشان بدەن بەختیار مردووە و پرسەی بۆ بگێڕن و کاتێك سەبوکتەکین هاتە لایان، بیگرن. کاتێك بەختیار تورکەکانی کرد، بەکۆتر نامەیەکی نارد و ئەوانی لەرووداوەکە ئاگادار کردەوە. کاتێك دایك و خوشکەکانی لەنامەکەی ئاگادار بوونەوە، دەنگی گریان و شین وڕۆڕۆیان لەماڵەکە بەرز کردەوە و بەگومانی ئەوەی سەبوتەکین دەنگیان دەبیستێت، هەواڵی مەرگی بەختیاریان بلاّو کردەوە. سەبوکتەکین کاتێك دەنگی گریانی بیست، کەسی نارد تا هەواڵی بۆ بێنێت. نێردراویان ئاگادار کردەوە کەبەختیار مردووە. سەبوکتەکین پرسیاری ئەوکەسەی کرد ئەم هەواڵەی هێناوە بەلاّم هیچی دەستنەکەوت تا پێی رازی ببێت لەبەر ئەمە گومانی لەراستی ئەم هەواڵە کرد.

لەم کاتەدا نێردراوی تورکەکان هات و لەوەی روویدابوو، سەبوکتەکینیان ئاگادار کردەوە و ئەو زانی ئەم کارە فریوێك زیاتر نییە. تورکەکان داوایان لێکرد پیلانێك دژی بنەماڵەی بەختیار دابڕێژێت بەلاّم ئەو، چاوەڕوان مایەوە و پەیکی بۆ لای باوکی ئیسحاق کوڕی مۆعیز ئەلدەولە نارد و ئاگاداری کردەوە کەپەیوەندی نێوان ئەو و براکەی خراپ بووە و هیوای باش بوونەوەی لێ ناکرێت و ئەوەی کەناخوازێت سەرپێچی فەرمانی گەورەکانی خۆی بکات هەرچەندە بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ بکەن و داوای لێدەکات فەرمانڕەوایەتی بەو بسپێرێت. باوکی ئیسحاق ئەم نامەیە بۆ دایکی دەخوێنێتەوە بەلاّم دایکی ڕێگەی ئەو کارەی لێدەگرێت.

سەبوکتەکین کاتێك ئەمەی بینی، لەگەڵ تورکەکان هێرشی کردە سەر ماڵی بەختیار و بۆ ماوەی دوو رۆژ گەمارۆیدا. دواتر سووتاندی و ڕۆشتە ناو کۆشکەکەی و باوکی ئیسحاق، باوکی تاهیر و کوڕەکەی مۆعیز ئەلدەولە و دایکی

ئەوان و دووان لەهاورێکانی ئەوانی گرت. ئەوان داوایان کرد ئازادیان بکات تا بەرەو واست بڕۆن. سەبوکتەکین ئازادی کرد و ئەوان ڕێگەی واستیان گرتەبەر. خەلیفە موتیع لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت بەڵام سەبوکتەکین کەسی نارد و ئەوی گەڕاندەوە و لەکۆشکەکەی داینیشاند. ئەم پێشهاتە لەنۆی زیقەعدە/ سێی ئۆگۆست ڕوویدا. هەموو سامانەکانی بەختیار لەبەغداد دەستی بەسەردا گیرا و تورکەکان ڕۆشتنە ماڵی دەیلەمییەکان و سامانی ئەوانیان تالأن کرد. سونییەکانی بەغداد هاوکاری سەبوکتەکینیان دەکرد چوونکە ئەو خۆی بەسوونی نیشان دەدا. سەبوکتەکینیش خەڵاتی پێ بەخشین و وەك سەرکردە و سالار دیاریکردن. سوونەییان دژی شیعەکان ئاڵای شۆڕشیبان بەرز کردەوە و بەم شێوەیە ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و کەرخی بەغداد دووبارە ئاگری گرت و سەرئەنجام سوونییەکان بەسەر شیعەکاندا زاڵ بوون.

## لابردنی موتیع و خەلافەتی تائیع لله

لەنیوەی زیقەعدە/ نۆی ئۆگۆستی ئەم ساڵە خەلیفە موتیع، کەئەندامەکانی سست و زمانی قورس و توانای جموجۆڵی لێبڕابوو، لەسەر کار لابرا. موتیع هەوڵی دەدا نەخۆشییەکەی خۆی بشارێتەوە بەڵام سەبوکتەکین پێی زانی و داوای لێکرد دەست لەخەلافەت هەڵبگرێت و تەختی خەلافەت بەکوڕەکەی تائیع لله بەناوی باوکی فەزڵ عەبدکەریم بسپێرێت. موتیع ئەو کارەی کرد و لەسیانزەی زیقەعدە/ حەوتی ئۆگۆست، دەستی لەکار کێشایەوە. ئەو چەند ڕۆژ کەمتر لەبیست و نۆ ساڵ و پێنج مانگ خەلافەتی کرد. دواتر بەیعەتیان لەگەڵ تائیع لله کرد.

## جەنگی نێوان مۆعیزلدینی عەلەوی و قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان بەفەرماندەیی حەسەن کوڕی ئەحسا هێرشیان کردە سەر میسر و گەمارۆیان خستەسەر. کاتێك مۆعیزلدین الله، فەرمانڕەوای میسر ئاگادار بوویەوە کەحەسەن کوڕی ئەحمەد هێرشی کردۆتەسەر میسر، نامەیەکی بۆ

نووسـی و لەپێـشییەکانی خـۆی و بنەماڵەکـەی بیرهێنایـەوە و نووسـی: ئامـانجی عەلەوییـەکان و قەرەمتییـەکان یـەك شـتە و باوەگـەوریکانی ئـەو سـەرەتا بانگەشـەکەرانی قـەرەمتی بـوون. لـەم نامـەدا مۆجیـاری حەسـەنی کـرد و ئاگـاداری کردەوە.

حەسـەن بـەم شێوەیە وەڵامی نامەکـەی دایـەوە: نامەیـەك کەدەسـهاتەکەی کـەم و لەپێشییەکانی زیاتر بوو، پێم گەیشت. بەدوای ئەم نامە بەرەو لای تۆ بەرێدەکـەوم. ماڵئاوا.

حەسـەن پێـشرەوی کـرد و گەیـشتە میـسر، لەعـەین شـەمس ئـوردووی لێـدا و ئاگری جـەنگ هەڵگیرسا. ئـەو دەسـتە جـەنگاوەرەکانی بـۆ تـاڵان کردنـی شـارەکان ڕەوانـە کـرد. هێـزی زیـاد و ژمارەیـەکی زۆر لەعەرەبـەکان پەیوەسـتی بـوون. یـەکێك لەو کەسانەی پەیوەستی بوو، حەسـان کـوڕی جـەراجی تـائی، ئـەمیری عەرەبـەکانی شام بوو کەدەستەیەك هاوڕێیەتیان دەکرد.

کاتێـك مـۆعێز ژمـارەی فراوانـی سـەربازەکانی حەسـەن کـوڕی ئەحمـەدی بینـی، هەسـتی بەمەترسـی کـرد و خـەمبار بـوو. سوپاکەی بۆ جـەنگ نەهێنایـە گۆڕەپـانی جـەنگ و لەگـەڵ خێرخوازەکـانی ڕاوێـژی کـرد. وتیـان: هـیچ چارەیەك نییـە مەگـەر دروسـت کردنـی دوو بـەرەکی لـەنێوان سـوپاکەی و تـەنیا بـەهاوکاری کـوڕی جـەراح ئەم کارە ئەگەری هەیـە. مۆعێز نامـەی بـۆ کـوڕی جـەراح نووسـی و دڵنـەوایی کـرد. سەد هەزار دیناری پێدا تـا ناسـازگاری لەگـەڵ قەرەمتییـەکان بکـات. کـوڕی جـەراح بەخواستەکانی مۆعێز ڕازی بـوو. ئـەویان بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم کـارە سـوێنددا. ئـەو سـوێندی خـوارد ئەگـەر پارەکـە بەدەسـتی بگـات، خـەڵك لـەدەوری حەسـەن کـوڕی ئەحمەد بڵاو دەکاتەوە.

ئەوان پارەکەیان بۆ کردەوە بەڵام کاتێك چاویان بەبڕی زۆری ئـەم پارەیـە کـەوت، بینیان زۆربەیان زێر نین و تـەنیا بەئاوی زێـر، ئاودراون. دینارەکانیـان خـستە نـاو کیسە و دینارە زێڕەکانیان کردە بەسەریا و بردیان بۆ کوڕی جەڕاح. کـوڕی جـەراح پەیامی بۆ مۆعێز نارد: لەفلان ڕۆژ سوپاکەی خـۆت بێنـەرە نـاو گۆڕەپـانی جـەنگ و ئەو (کوڕی جەراح) لەم ڕۆژەدا لەفلانی باڵی سوپا و گۆڕەپان دەبێت و لەم جەنگەدا

لەگەڵ هاوەڵانی ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. مۆعێز ئەو کارەی کرد. کوڕی جەراح گۆڕەپانی جەنگی بەجێهێشت و هەموو عەرەبەکان بەدوای ئەو هەڵاتن. کاتێک حەسەنی قەرەمتی هەواڵی هەڵاتنی ئەوانی بیست، سەریسوڕما و خۆی و سوپاکەی خۆڕاگرییان کردە پیشە. سوپاکەی مۆعێز چاوی تەماحیان تێبڕی و لەهەموو قۆڵەکانەوە هێرشیان کردەسەر و هێز و توانایان لێ بڕی. ئەویش هەڵات و سوپاکەی مۆعێز شوێنی کەوت و دەستی بەسەر ئوردووگاکەیدا گرت و ژمارەیەکی زۆری ئەسیر کردن. ئەسیرەکان هەزار و پێنسەد کەس بوون. فەرمانی سەربڕینی هەموو ئەسیرەکان درا و ئوردووگاکەی تاڵان کرا.

دواتر مۆعێز، باوکی محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی جەعفەری فەرماندەی لەگەڵ دەهەزار کەس کۆکردەوە و فەرمانی پێدا شوێنپێی قەرەمتییەکان هەڵبگرێت و سەرکوتیان بکات. باوکی محەممەد شوێنیان کەوت بەڵام لەترسی گەڕانەوە و هێرشی قەرەمتییەکان، کەمتەرخەمی لەخۆی نیشاندەدا. قەرەمتییەکان ڕۆشتن و گەیشتنە ئەزرێعات و لەوێوە بۆ سەرزەمینی خۆیان ئەحسا گەڕانەوە و وایان نیشاندا دووبارە هێرش دەکەنە سەر میسر.

## زاڵبوونی مۆعێز لەدیمەشق و ئاژاوەکانی ئەم شارە

کاتێک مۆعێز لەهەڵاتنی قەرەمتی لەشام و گەڕانەوەی بۆ سەرزەمینی خۆی ئاگادار بوویەوە، زاڵم کوڕی مەوهوبی عەقیلی فەرماندەی وەك کارگوزاری شام دیاریکرد. ئەو ڕۆشتە شام و پێگەی بەرز بوویەوە و هاوەڵ و سامان و توێشووی زۆری کۆکردەوە چوونکە باوکی مونجی و کوڕەکەی، دووان لەهاوەڵانی قەرەمتی و ژمارەیەك لەهاوەڵانی ئەوان لەدیمەشق بوون. زاڵم ئەوانی گرت و زیندانی و سامانەکانی زەوت کردن.

دواتر باوکی مەحمودی فەرماندار کەمۆعێز ئەوی بۆ شوێنکەوتنی قەرەمتییەکان ڕەوانە کردبوو، چەند ڕۆژ دوای گەیشتنی زاڵم بەدیمەشق گەیشتە ئەم شارە. زاڵم بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی لێکرد چوونکە هەستی دەکرد قەرەمتی بۆ ئەو سەرزەمینە دەگەڕێتەوە. ئەو داوای لەمەحمود کرد لەدەرەوەی شارەکە

ئوردووی لێ بدات. مەحمود ئەو کارەی کرد. زاڵم، باوکی مونجی و کوڕەکەی و کەسێکی دیکە بەناوی نابلسی بەمەحمود سپارد. نابلسی لەڕەملە هەڵاتبوو و خۆی لەقەرەمتی نزیک کردەوە بەڵام لەدیمەشق گیرا. باوکی محەممەد ئەوانی بۆ میسر نارد. باوکی مونجی و کوڕەکەی زیندانی کران. بەنابلسیان وت: ئایا تۆ ئەو کەسە نیت کەوتووتە ئەگەر دە تیرم دەبوو، نۆ تیرم بۆ مەغریب و تیرێکم بۆ رۆم دەهاویشت؟ ئەو ئەم قسەی پشت راست کردەوە. پێستیان لەجەستەی داماڵی و هەڵیانواسی.

کاتێك باوکی مەحمود لەدەرەوەی دیمەشق ئوردووی لێدا، دەستی هاوەڵانی بۆ خراپەکاری درێژ بوو، رێگەکانیان دەبڕی. خەڵکان پەرێشان و ترسان. دواتر فەرماندەی پاسەوانەکان، یەکێك لەدانیشتووانی دیمەشقی کوشت و بەهۆیەوە ئاژاوە سەریهەڵدا و خەڵکان هاوەڵانی ئەویان (فەرماندەی پاسەوانەکان) کوشت. زاڵم لەناو خەڵکان دەژیا و رێگەی سازگاری لەگەڵ ئەوان دەگرتەبەر.

خەڵکی گوندەکان لەتاڵانکاری فراوانی مەغربییەکان و ستەمکاری ئەوان لەگوندەکانی خۆیانەوە پەنایان بۆ شارەکە برد. لەنیوەی شەوال/ دەی جولای لەنێوان سوپای باوکی مەحمود و خەڵکی گەڕەك و کۆڵانەکان جەنگ روویدا. زاڵم لایەنگری خەڵکی گەرەك و کۆڵانەکان بوو، وای نیشان دەدا مەبەستی رێکخستن و سەقامگیر کردنی کاروبارەکانی هەیە بەڵام باوکی مەحمودی لەمەبەستەکەی خۆی ئاگادار نەدەکردەوە تا ئەوەی ئەم دوو دەستەیە لەیەك جیابوونەوە.

یەکێکی دیکە لەپێشهاتەکان ئەوە بوو هاوەڵانی باوکی مەحمود، لەکەنارەکانی دیمەشق، کاروانێکیان گرت کە لەدیمەشقەوە دەهات و سێ کەس لەکاروانییەکانیان کوشت. بنەماڵەی کوژراوەکان جەنازەی ئەوانیان لەمزگەوت دانا. بازارەکان بەستران و خەڵك ترسان و خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد بەڵام فرەزانەکان هێوریان کردنەوە.

یەکیتر ئەوەی مەغربییەکان دەیانویست قینییە و لۆلۆ تاڵان بکەن بەڵام کەسێك جاڕیدا و خەڵکانی ئاگادار کردەوە. خەڵك ئامادە و لەحەڤدەی زیقعدە/ یانزەی ئۆگۆست، رووبەرووی مەغربییەکان بوونەوە. باوکی مەحمود و سوپاکەی

هێرشیان کردە سەر خەڵکان و خەڵکان بەرەو دیواری شارەکە هەڵاتن و لەوێ خۆڕاگرییان کردە پیشە. دانیشتووانی شارەکە پەیوەستیان بوون و لەوێوە مەغربییەکانیان تیرباران کرد. ژمارەیەکی زۆریان لەسوپاکەی باوکی مەحمود برینداز کرد کەبەناچاری گەڕانەوە و خەڵکان شوێنیان کەوتن. مەغربییەکان بەناچاری بۆ گۆڕەپانی جەنگ گەڕانەوە و ئەمجارە ئەوان شوێنپێی خەڵکانیان هەڵگرت. خەڵکان هەڵاتن و زاڵم لەکۆشکی فەرمانڕەوایی هاتەدەر.

مەغربییەکان لەدەروازەی فەرادیسەوە ئاگریان بەردایە شارەکە و ئەو کەنارەیان سووتاند. ئاگر بەرەو قیبلە بڵێسەی دەسەند و بەشێکی زۆری شارەکەی سووتاند و ژمارەیەك لەخەڵکان مردن و کەل و پەلی لەژمارە نەهاتوو بوو بەخۆراکی ئاگر. بەمشێوەیە خەڵکان ڕێگەی سازگارییان لەگەڵ باوکی مەحمود گرتەبەر و تا رەبیع الاخری ٣٦٤/ نۆڤەمبەری ٩٧٤ زایینی، ئەم دۆخە درێژەی کێشا.

## فەرمانڕەوایی جەیش کوڕی سەمسامە لەدیمەشق

لەرەبیع الاخری ٣٦٤/ دێسامبەری ٩٧٤ زایینی، دووبارە ئاژاوە لەدیمەشق سەری هەڵدا و چەندین گفتوگۆ بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی ئەنجامدرا. سەرئەنجام باوکی مەحمودی فەرماندە و دیشمەقییەکان بڕیاریاندا زاڵم لەشارەکە دەرکەن و جەیش کوڕی سەمسامە، خوشکەزای باوکی مەحمود لەجێگەی ئەو دابنێن. زاڵم لەشارەکە ڕۆشتەدەر و جەیش کوڕی سەمسامە جێگەی گرتەوە. ئاژاوە دامرکایەوە و خەڵکان هێور بوونەوە.

چەند ڕۆژ دواتر مەغربییەکان خراپەکارییان کردە پیشە و دەروازەی فەرادیسیان وێران کرد. خەڵك ڕووبەڕوویان بوونەوە و هەرکەسیان گرت، خوێنیان ڕشت. دواتر ڕوویان کردە کۆشکێك کەجەیش لەوێ دەژیا. جەیش و سوپا مەغربییەکەی هاوڕێی هەڵاتن و پەیوەستی سوپاییەکان بوونەوە. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە، یەکی جومادی الاوەل/ بیست و هەشتی ژانویە، جەیش لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر شارەکە. دانیشتووان ڕووبەڕووی بوونەوە بەڵام ئەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ئەو بەشانەی شارەکە کەزیانیان پێنەگەیشتبوو،

سووتاندی. جەنگی نێوان ئەم دوودەستەیە چەند رۆژێك درێژەی کێشا. خەڵکانی شار بەترس و نیگەرانییەوە ژیانیان بەسەر دەبرد. ماڵەکان وێران بوون و چیتر خواردەمەنی بەشارەکە نەدەگەیشت، رێگەکان بەستران و ئالْ و گۆڕ لەشارەکەدا نەدەکرا. چیتر ئاو لەشارەکە دەستنەدەکەوت و کاریز و گەرماوەکان لەکار کەوتن و ژمارەیەکی زۆر لەنەدارەکان لەسەر رێگەکان مردن بەلاّم بە لەسەرکار لابرانی باوکی مەحمود، بارودۆخی خەڵکان کەمێك باشتر بوو.

## هاتنە سەکاری رەبییانی خزمەتکار لەدیمەشق

کاتێك -وەك ئاماژەمان پێدا- جەنگ و ئاگرکەوتنەوە و وێرانی بەرۆکی دیمەشقی گرت، مۆعێز، فەرمانڕەوای میسر ئاگادار بوویەوە. ئەم هەواڵەی پێناخۆش بوو و بەکارێکی قێزەونی لەقەڵەمدا. کەسی بۆ لای ڕەبییانی خزمەتکار، کارگوزاری تەرابلوس نارد و فەرمانی پێدا بۆ لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی دیمەشق و چەند و چۆنیەتییەکەی و گەڕاندنەوەی باوکی مەحمود لەو شارە، بەرەو دیمەشق بەرێکەوێت. رەبییان بەرەو دیمەشق بەرێکەوت و لێکۆڵینەوەی لەکاروبارەکان کرد و هەواڵەکەی بۆ مۆعێز نووسی. فەرمانی بەباوکی مەحموددا شارەکە بەجێبێڵێت. باوکی مەحمود لەگەڵ ژمارەیەك بەرەو ڕەملە بەرێکەوت و زۆربەی سەربازەکان لەگەڵ رەبییان لەشارەکە مانەوە. بارودۆخ بەو شێوە مایەوە تا فەتکین -ئاماژەی پێدەدرێت- هاتە سەرکار.

## بەسەرهاتی بەختیار دوای گرتنی تورکەکان

کاتێك -ئاماژەمان پێدا- بەختیار تورکەکانی گرت، دەستی بەسەر پاشەکەوتەکانی ئازادرووییە لەجوندیشاپور گرت. لەم کاتەدا بیری لەوەی کردەوە تورکەکان چییان لەگەڵ سەبوکتەکین کرد و ئەوەی دەستەیەك لەوان لەکەنارەکانی ئەهواز دژی سەبوکتەکین شۆڕشیان کردووە. گەورەکانی تورك لەبەسرە هاتنە لای بەختیار و بۆ کردەوەکانی سەرکۆنەیان کرد. بیرمەندانی دەیلەم پێیان وت: بۆ جەنگ، ناچارین

تورکەکانمان لەگەڵدا بێت تا بەتیرەکانیان بەرگریمان لێ بکەن. بەختیار پەرێشان و ئازادرووبەی ئازاد و لەجیاتی سەبوکتەکین ئەوی وەك فەرمانده‌ی سوپا دەستنیشان کرد بەو گومانەی تورکەکان بەبوونی ئەو هێور ببنەوە. بەختیار گیراوەکانی دیکەیشی لەزینـدان هێنایـەدەر و خـۆی بـۆ لای دایـك و خوشـکەکانی لەواسـت بەرێکـەوت و نامەیەکی بۆ مامی، رۆکن ئەلدەولە و کوڕە مامەکەی عێزەد ئەلدەولـە نووسی و داوای هاوکـاری لێکـردن و لـەبارودۆخی خـۆی، ئاگـاداری کردنـەوە. نامەیـەکی بـۆ تەغلـەب کوڕی حەمدانیش نووسی و داوای لێکرد هاوکاری بکات و ئەگەر ئەو کارە بکات، لەو بـڕە پـارەی دەبێـت، بیـدات، دەبەخـشرێت. خـەڵاتی بـۆ شـاهین لەبوتەیحـە نـارد و پاشماوەی ئەو پارەی لەسەر شانی بەختیار مابوویەوە، هەڵگرت و یەکێك لەکچەکانی خۆی کردە هاوسەری ئەو. داوای لێکرد سوپایەك بۆ هاوکاری بنێرێت.

رۆکن ئەلدەولەی مامی، سوپایەکی بەفەرمانـدەیی وەزیرەکـەی، باوکی فـەتح کـوڕی عەمیـد نـارد و نامەیـەکی بـۆ عێـزەد ئەلدەولـەی کـوڕی نووسـی و فـەرمانی پێـدا بـۆ هاوکاری مامی بەرێکەوێت و پەیوەستی کوڕی عەمید ببێت. عێزەد ئەلدەولـە بەڵێنیـدا دەڕوات و لەبـەر تـەماحی بۆ فەرمانڕەوایـەتی عێـراق، چاوەڕوان بـوو کـاتی گرفتـاری بەختیار بگات.

عیمران کوڕی شاهین لەوەڵامی نامەی بەختیار وتی: بەخشرانی ئێمە لەو پارەیـە، دڵنیـایین پێـدانی ئـەو پـارە هـیچ بنەمایـەکی نییـە و مـن لـەخۆوە پێـی رازی بـووم، سـەبارەت بەهاوسـەرگیریش، مـن تـەنیا کـچێك وەك هاوسـەر هەڵدەبـژێرم کـەخۆم خوازبێنیم کردبێت و عەلەوییەکان، کەگەورەی ئێمەن، داوایان کردووە کچێکی ئـەوان بکەمە هاوسەری خۆم بـەڵام هێشتا وەڵامم نەداونەتـەوە، سەبارەت بەخـەڵات و ئەسپ دەبێت بڵێم لەو کەسانە نییم بەم شتانەی ئێوە رازی بێت بەڵکو کورەکەم هـەڵیگرتووە. ناتوانم سوپایش ڕەوانە بکەم چوونکە پیاوەکانی من لەبەر ئەوەی ژمارەیـەکی زۆریـان لـەئێوە کوشتووە، نـاتوانن لای ئێـوە بمێننەوە. دواتـر بـەردەوام کردەوەکـانی خـۆی و باوکی بیرهێنایەوە و وتی: بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێت بەناچاری پـەنا بـۆ ماڵەکـەی مـن بێنیـت و لـەو کاتـەدا سـوێند بـەخوا، بەشێوەیەك مامڵـەی لەگـەڵ دەکـەم جیـاواز لەکردەوەکانی ئەوان بێت. ئەوە روویدا کەپێشبینی کردبوو.

بەڵام بـاوکی تەغلـەب وەڵامـی دایـەوە بـەخێرایی بەرێدەکـەوێت. ئـەو براکـەی خـۆی،

باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدانی لەگەڵ سوپایەك بۆ تکریت نارد و چاوەڕوانی هاتنی تورکەکان لەبەغدادەوە بوو چوونکە ئەگەر ئەوان سەرکەوتنیان بەسەر بەختیار بەدەست دەهێنا، ئەو دەڕۆشتە بەغداد و فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی دەگرتەدەست. کاتێك تورکەکان لەبەغدادەوە بەرێکەوتن، باوکی تەغلەب رێگەی بەغدادی گرتەبەر تا بەختیار بەبەخشینی ئەو برە پارەیە ناچار بکات کەدەبووا باوکی تەغلەب رەوانەی بەغدادی بکات. سوپاکەی باوکی تەغلەب کاتێك گەیشتە بەغداد کەخەڵکان گرفتاری خراپەکاران ببوون. ئەو پشتیوانی لەدانیشتووانی شارەکە کرد و بەڵای خراپەکارانی لەسەری ئەوان کەم کردەوە.

بەڵام تورکەکان لەگەڵ سەبوکتەکین بەرەو واسط بەرێکەوتن و خەلیفە تائیع و خەلیفەی لەسەر کارلابراو، موتیعیان لەگەڵ خۆیان برد. کاتێك گەیشتنە دێری عاقول، موتیع مرد و سەبوکتەکین بەهۆی نەخۆشییەوە مرد. جەنازەی هەردووکیان بردە بەغداد و تورکەکان، فەتکینیان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد. ئەو یەکێك لەسەرکردە گەورەکان و موالییەکانی مۆعێز ئەلدەولە بوو. بەختیار لەمەرگی سەبوکتەکین شادمان و گومانی کرد بەمەرگی ئەو بارودۆخی تورکەکان پەرێشان دەبێت بەڵام کاتێك بینیان بارودۆخیان سەقامگیر بووە، نیگەران بوو.

بەختیار لەواسط بوو کەتورکەکان بەرێکەوتن و لەنزیك شارەکە ئوردوویان لێدا و نزیکەی پەنجا رۆژ بەجەنگەوە سەرقاڵ بوون. جەنگی نێوان تورکەکان و بەختیار درێژەی کێشا و هەموو جارێك سەرکەوتن بەتورکەکان دەبڕا. ئەوان گەمارۆیان خستە سەر بەختیار و بارودۆخیان لێ دژوار کرد. بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر. بەختیار بەنیگەرانییەوە چاوەڕوانی هێزی هاوکاری بوو. بەردەوام پەیکی بۆ لای عێزەد ئەلدەولە دەنارد و بۆ هاوکاری کردنی خۆی هانیدەدا. بۆ عێزەد ئەلدەولەی نووسی:

فان كنت ما كولا فكن انت آكلي          و الا فادركني و لما امزق

واتاکەی: ئەگەر دەبێت بخوردرێم، تۆ بمخۆ، وەگەرنە پێش ئەوەی لەت لەت بکرێم، فریام کەوە.

کاتێك عێزەد ئەلدەولە ئەمەی بینی و دڵنیابوو لەوەی بارودۆخ لەسەر بەختیار دژوار بووە، رێگەی بەغدادی گرتەبەر و وای نیشان دەدا بۆ هاوکاری بەختیار دەڕوات هەرچەندە مەبەستەکەی جیاواز بوو.

## فەرمانڕەوایی عیزەد ئەلدەولە لەعەممان

لەرەبیع الاوەل/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە باوکی قاسم موتەهەر کوڕی محەممەد وەزیر عیزەد ئەلدەولە، بەسەر چیاکانی عەممان و شارییەکان دانیشتووانی ئەو ناوچەدا زاڵ بوو.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك مۆعیز ئەلدەولە مرد، جێگرەکەی، باوکی فەرەج کوڕی عەباس لەعەممان لەوێ ڕۆشت و عومەر کوڕی نەهبانی تائی کاروباری ئەو ناوچەی گرتەدەست و خەڵکی بۆ پەیوەست بوون بەعیزەد ئەلدەولە هان دەدا. دواتر زەنگییەکان دەستیان بەسەر ئەم سەرزەمینەدا گرت. دەستەیەك لەسەربازەکان هاوڕێیان بوون. ئەوان کوڕی نەهبانیان کوشت و پیاوێکیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد بەناوی کوڕی حەلاج. عیزەد ئەلدەولە سوپایەکی لەکرمانەوە بەفەرمانداریی باوکی حەربی توغان بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد. ئەوان لەرێگەی دەریاوە خۆیان گەیاندە عەممان. باوکی حەرب لەدەریاوە هاتە وشکانی و کەشتییەکان ڕۆشتن و گەیشتنە سوحار یەکێك لەگوندەکانی عەممان. لەوێ زەنگییەکان و سوپاییەکانی هاوڕێی ئەوان، ڕووبەڕوویان بوونەوە و لەدەریا و وشکانی شەڕێکی مەترسیداریان هەڵگیرساند و سەرئەنجام باوکی حەرب سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دەستی بەسەر سوحار گرت. دانیشتووانەکەی هەڵاتن. ئەم جەنگە لەساڵی ٩٧٢/٣٦٢ زایینی ڕوویدا.

دواتر زەنگییەکان لەبەریم کۆبوونەوە. بەریم گوندێك بوو بەدووری دوو مەنزڵ لەسوحار. باوکی حەرب هێرشی کردەسەریان و جەنگ ڕوویدا. دەرئەنجامەکەی بەمەرگ و ئەسیر کرانی زەنگییەکان کۆتایی هات و بەم شێوەیە ئارامی بۆ ئەو ناوچەیە گەڕایەوە.

لەلایەکی دیکە ژمارەیەکی فراوان لەشارییەکان لەکوێستانەکانی عەممان کۆبوونەوە و فەرمانڕەوایەکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد بەناوی وەرد کوڕی زیاد و خەلیفەیەك بەناوی حەفس کوڕی ڕاشید. پێگەی ئەوان بەرز بوویەوە. عیزەد ئەلدەولە، موتەهەر کوڕی عەبدوللەی لەرێگەی دەریاوە ڕەوانە کرد. موتەهەر گەیشتە کەنارەکانی حەرفان لەدەوروبەری عەممان و دانیشتووانەکەی سەرکوت و

ژمارەیەکی لێ ئەسیر کردن. دواتر ڕێگەی دومای گرتەبەر. دووری دوما لەسوحار چوار ڕۆژ بوو. ئەو ڕووبەڕووی دانیشتووانی دوما بوویەوە و بەتەواوی سەرکوت و لەناوی بردن. ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردە و سەرۆکەکانی ئەوانی کوشت و ئەسیر کرد. فەرمانڕەوای ئەوان، وەرد و پێشواکەیان، حەفس، هەڵاتن. موتەهەر تا نەزوی (گوندێك لەو کوێستانە) شوێنیان کەوت. ئەم دەستەیە لەوێ هەڵاتن. دەستەیەك شوێنپێیان هەڵگرتن و بەرادەیەك کوشتاریان کرد کەکەسیان نەمایەوە. وەرد کوژرا و حەفس بۆ یەمەن هەڵات و لەوێ مامۆستایەتی کردە پیشە. موتەهەر بەرەو ناوچەیەك بەناوی شۆرف (شەرف) بەڕێکەوت. نزیکەی دەهەزار کەس لەعەرەبەکان لەوێ کۆببوونەوە. موتەهەر ئەوانیشی سەرکوت کرد. بەمشێوەیە ئارامی و ئاسایش بۆ ئەو ناوچەیە گەڕایەوە و چیتر ناسازگاران لەوێ نەدەبینران.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەکاتی حەجی ئەم ساڵە لەمەککە و مەدینە بەناوی مۆعیزلدینی عەلەوی، فەرمانڕەوای میسر، وتار دەخوێندرایەوە.

لەم ساڵەدا منداڵەکانی هیلال و ژمارەیەك لەعەرەبەکان هێرشیان کردەسەرە کاروانی حاجییەکان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. بارودۆخ لەکاتی حەج بەرادەیەك دژوار بوو، حەج بەتاڵ بوویەوە و کەس بێ زیان دەرنەچوو جگە لەو کەسانەی لەگەڵ شەریف باوکی ئەحمەدی موسەوی، کە لەڕێگەی مەککەوە ڕۆشتنە مەککە و حەجی خۆیان کرد.

لەم ساڵەدا لەمانگی زیحەججە/ ئۆگۆست لەواست ئەردهەژێنێك ڕوویدا.

لەم ساڵەدا عەبدولعەزیز کوڕی جەعفەر کوڕی ئەحمەد کوڕی یەزداد، فەقیهی حەنبەلی، ناسراو بەکۆیلەی خەلال، لەتەمەنی هەشتا و هەشت ساڵی کۆچی دوایی کرد.

لەکۆتایی ئەم ساڵە، مێژووی سابت کوڕی سەنان کوڕی سابت کوڕی قورە کەسەرەتاکەی لەخەلافەتی موقتەدر بالله لەساڵی ٢٩٥/٩٠٧ زایینییەوە، کۆتایی پێهات.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و چواری کۆچی ( ٩٧٤و٩٧٥ زایینی )

### زاڵبوونی عیزەد ئەلدەولە لەعێراق و گرتنی بەختیار

لەم ساڵەدا عیزەد ئەلدەولە گەیشتە عێراق و دەستی بەسەردا گرت وبەختیاری قۆڵبەست کرد. دواتر گەڕایەوە و ئەوی لەعێراق دوورخستەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك نامە یەك لەدوای یەکەکانی بەختیار بەعیزەد ئەلدەولە دەگەیشت و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تورکەکان داوای هاوکاری لێدەکرد، عیزەد ئەلدەولە لەگەڵ سوپاییەکانی فارس بەڕێکەوت و باوکی فەتح کوڕی عەمید، وەزیری ڕۆکن ئەلدەولە، لەگەڵ سوپاییەکانی ڕەی کە لەئەهواز مابوونەوە، پەیوەستی بوو و هەموویان ڕێگەی واستیان گرتەبەر. کاتێك فەتکین لەهەواڵی هاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، بۆ بەغداد گەڕایەوە و بڕیاریدا ئەم شارە پشتگوێ بخات و بۆ گرتنی دیالە بجەنگێت.

عیزەد ئەلدەولە گەیشت و بەختیار پەیوەستی بوو. عیزەد ئەلدەولە ڕۆشتە بەشی ڕۆژهەڵاتی بەغداد و فەرمانی بەبەختیاردا بەرەو ڕۆژئاوای شارەکە بڕوات.

کاتێك ئەم هەواڵە بەباوکی تەغلەب کە لەفەتکینەوە نزیك بوو، گەیشت، لەبەغدادەوە ڕێگەی موسڵی گرتەبەر چوونکە هاوەڵانی لەموسڵ شۆرشیان کردبوو و نەیدەتوانی لەوێ بمێنێتەوە. فەتکین -بەدوای ڕۆشتنی باوکی تەغلەب- گەیشتە بەغداد و لەهەمو قۆڵەکانەوە گەمارۆیدا چوونکە بەختیار پێشتر نامەی بۆ زەببە کوڕی محەممەدی ئەسەدی لەخەڵکانی عەین تەمر کەموبتەنی لەهۆنراوەکانی خۆیدا سەرکۆنە کردووە، نووسیبوو کەنارەکانی بەغداد تاڵان بکات و ڕێگە نەدات خواردەمەنی پێ بگات. ئەو نامەیەکی هاوشێوەی بۆ مناڵەکانی شەیبان نووسی. باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان ڕێگەی نەدا خواردەمەنی لەموسڵەوە بەبەغداد بگات. بەمشێوەیە گرانی لەبەغداد دروست بوو و خراپەکاران و سەرسەرییەکان ئاژاوەگێرییان دەست پێکردەوە و سامانی خەڵکیان لەبەغداد تاڵان کرد. خەڵك لەترسی ئاژاوە و نەبوونی خۆراك و توێشوو و هێرشی هێزەکانی فەتکین بۆ

ماڵەکانیان، زەوی گیر بوون.

عێزەد ئەلدەولە هێرشی کردەسەر بەغداد. فەتکین و تورکەکان لەنێوان دیالە و مەدائین رووبەرووی بوونەوە و شەڕێکی قورس دەستپێکرد. دەرئەنجام تورکەکان هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. تورکەکان خۆیان گەیاندە دیالە و لەجسرەکەی پەڕینەوە بەڵام زۆربەی هەلاتووان لەئاودا نغرۆ بوون. ژمارەیەك لەخراپەکارانیش کەهاوکاری ئەوانیان کردبوو، کوژران و نوقم بوون. سوپای عێزەد ئەلدەولە گەیشتە ئوردووگاکەیان و تالآنی کرد. ئەم جەنگە لەرۆژی چواردەی جومادی الاوەل/ یەکی فەوریە روویدا.

تورکەکان خۆیان گەیاندە تکریت و عێزەد ئەلدەولە تا دەرەوەی بەغداد ڕۆشت و کاتێك لەگەیشتنی تورکەکان بۆ تکریت ئاگادار بوویەوە، گەڕایەوە بۆ بەغداد و ڕۆشتە ناو کۆشکی فەرمانڕەوایی. تورکەکان پێش بەجێهێشتنی بەغداد بەزۆر خەلیفەیان لەگەڵ خۆیان بردبوو. عێزەد ئەلدەولە هەوڵیدا خەلیفە بۆ بەغداد بگێڕێتەوە. خەلیفە لەهەشتی ڕەجەب/ بیست و پێنجی مارس لەرێگەی رووبارەوە گەیشتە بەغداد. عێزەد ئەلدەولە بۆ پێشوازی کردنی بەرەو دیجلە بەرێکەوت. لەم کاتەدا ژمارەیەکی زۆر لەبەلەم و کەشتییە جەنگییەکان لەدیجلەدا دەبینرا و شارەکە بەتەواوی چۆڵ ببوو. کەشتییە جەنگییەکان بەرادەیەك لەناو دیجلەدا زۆر بوون ئەگەر کەسێك دەیویست بێ کەوتنە ناو ئاوەکە، دەیتوانی لەسەر ئەم کەشتییە بڕواتە سەر کەشتییەکی دیکە. عێزەد ئەلدەولە بوو بەهاوڕێ خەلیفە و ڕۆشتە ناو کۆشکی خەلافەت.

عێزەد ئەلدەولە چاوی تەماحی بڕیبووە عێراق و بەختیاری بەکەسێکی ناتەوان دەزانی بەڵام لەترسی باوکی، هیچ کارێکی نەکرد و لەلایەکی دیکە، سوپاییەکانی دژی بەختیار هان دەدا تا ئاڵای شۆڕش بەرز بکەنەوە و داوا لەبەختیار بکەن، لەبەر خۆڕاگری و تێکشکاندنی تورکەکان خەڵاتیان بکات. سەربازەکان مەبەستەکەی ئەویان هێنایەدی و بۆ وەرگرتنی خەڵات زێدەڕۆییان کرد بەڵام بەختیار پارەی لەبەردەستا نەبوو چوونکە بەشێکی تالآن و پاشماوەکەی خەرج کردبوو. بارودۆخی وڵاتیش پەرێشان و لەبەر ئەمە دەستی بەهیچ کوێ نەدەگەیشت.

لەم کاتەدا عیزەد ئەلدەولە داوای لەبەختیار کرد گرنگی بەخواستی سوپاییەکان نەدات و بەشێوەیەکی توند وەڵامیان بداتەوە. پێی وت بەڵێنی شتێکیان پێنەدات کە لەتوانایدا نییە و پێیان بڵێت حەز بەفەرمانڕەوایەتی ئەوان ناکات. عیزەد ئەلدەولە بەڵێنی پێدا ئەگەر ئەو کارە بکات لەنێوان ئەو و سوپاییەکان دەبێتە نێوەنجیگەر. بەختیار گومانی کرد عیزەد ئەلدەولە چاکەخواز و خێرخوازی ئەوە و حەز بەباش بوونەوەی بارودۆخی دەکات لەبەر ئەوە پێشنیارەکانی بەکار برد و لەفەرمانڕەوایەتی دەستی کێشایەوە و دەرگای کۆشکەکی بەسەر خۆیدا بەست و دەبیر و پەردەدارەکانی لەسەر کار لابرد. عیزەد ئەلدەولە بەڕواڵەت لەبەردەم ژمارەیەك لەسەرکردەکانی سوپا نامەی بۆ نووسی و دوای لێکرد بڕواتە لایان و ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بێنێت بەلام پێشتر بەخۆی وتبوو بەم پێشنیارەی رازی نەبێت. بەختیار ئەو کارەی کرد کەعیزەد ئەلدەولە پێی وتبوو. لەوەڵامدا وتی: من فەرماندەی ئەوان نیم و لەنێوان من و ئەوان هیچ پەیوەندییەك نییە و لەوان بەدوورم. سێ ڕۆژی بەردەوام پەیك لەنێوان ئەوان هاتوچۆی کرد و عیزەد ئەلدەولە بەردەوام ئەوانی دژی بەختیار هان دەدا و شۆڕش تەشەنەی دەسەند. لەم کاتەدا بەختیار پەیکی بۆ لای عیزەد ئەلدەولە نارد و داوای لێکرد بەڵێنەکانی خۆی بێنێتەدی. عیزەد ئەلدەولە بەفرت و فێڵ بلاوەی بەسوپاییەکان کرد و بەختیار و خوشکەکانی بۆ لای خۆی برد و هەموویانی گرت و پاسەوانی بۆ دانان. دواتر خەڵکانی کۆکردەوە و لەدەست لەکار کێشانەوەی بەختیاربەهۆی ناتەوانی ئاگاداری کردنەوە و بەڵێنی پێدان چاکەیان لەگەڵ بکات. خەڵك بەوتەکانی ئەو ئارام بوونەوە. عیزەد ئەلدەولە بەختیاری لەبیست و شەشی جومادی الاخر/ سیانزەی مارس قۆلبەست کرد.

خەلیفە تائیع الله، بەختیاری خۆش نەدەویست چوونکە لەجەنگەکان هاوکاری تورکەکان بوو. کاتێك خەلیفە لەهەواڵی گیرانی بەختیار ئاگادار بوویەوە، شادمانی خۆی دەربڕی و بۆ لای عیزەد ئەلدەولە گەڕایەوە. عیزەد ئەلدەولە باسی پێگەی بەرزی خەلیفەی کرد کەچیتر گرنگی پێنەدەدرا و فەرمانی نۆژەن کردنەوەی کۆشکی خەلافەتی دەرکرد و خوازیاری پڕ کردنی کۆشك بەکالا گرانبابیەکان بوو.

فەرمانیدا ئەوەی لەدەستی خەلیفەدایە سامان بدرێت و پشتیوانی لەزەوییەکانی ئەو کرد. کاتێك خەلیفە هاتە بەغداد و ڕۆشتە ناو کۆشکی خەلافەت، عیزەد ئەلدەولە سامانێکی زۆری بۆنارد. چەندین کالآی گرانبایی و راخەری و دیاری دیکەی پێشکەش کرد.

## گەڕانەوەی بەختیار بۆ فەرمانڕەوایەتی

کاتی قۆلبەست کرانی بەختیار، مەرزوبانی کوڕی فەرمانڕەوای بەسرە بوو. کاتێك لەگیرانی باوکی ئاگادار بوویەوە، پشتی کردە عیزەد ئەلدەولە. ئەو نامەیەکی بۆ رۆکن ئەلدەولە نووسی و لەو بەلآی لەلایەن عیزەد ئەلدەولە و باوکی فەتح کوڕی عەمید بەسەر باوکی و پورەکانی هاتبوو، سکالآی کرد و لەفرت و فێڵەکانی عیزەد ئەلدەولە ئاگاداری کردەوە. رۆکن ئەلدەولە کاتێك ئەمەی بیست، خۆی لەسەر تەختەکەی هەڵدایەخوار و چەند رۆژێك خواردن و خواردنەوەی نەخوارد و بەشێوەیەك نەخۆش کەوت کەتا کۆتایی ژیانی ئەم نەخۆشیەی بەرۆکی بەرنەدا.

دوای بەختیار، محەممەد کوڕی بەقیە، وەزیری بەختیار، خزمەتی عیزەد ئەلدەولەی دەکرد و بەڵێنی بەرێوەبردنی واست و کەنارەکانی پێدا بەلآم کاتێك بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوت، لەبەر قۆلبەست کرانی بەختیار، سەرپێچی فەرمانەکانی عیزەد ئەلدەولەی کرد و نارەزامەندی خۆی نیشاندا و نامەیەکی بۆ ئیبراهیم کوڕی شاهین نووسی و داوای هاوکاری لێکرد و لەفرت وفێڵەکانی عیزەد ئەلدەولە ئاگاداری کردەوە. عیمران بەداواکەی رازی بوو.

عیزەد ئەلدەولە، سەهل کوڕی بیشر، وەزیری فەتکینی لەزیندان هێنایەدەر کەپێشتر لای بەختیار زیندانی کرابوو و شاری ئەهوازی پێسپارد. محەممەد کوڕی بەقیە نامەیەکی بۆ نووسی و تۆوی خۆشەویستی لەدڵی چاند. سەهل بەداواکەی رازی بوو. کاتێك کوڕی بەقیە، سەرپێچی کرد، عیزەد ئەلدەولە سوپایەکی گەورەی بۆ سەرکوت کردنی نارد. کوڕی بەقیە لەرێگەی دیجلەوە، لەگەڵ ئەو سوپایەی عیمران کوڕی شاهین بۆ هاوکاری ناردبووی، بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەم سوپایە

بەرێکەوت. سوپاکەی عیزەد ئەلدەولە بەریسوایی شکستیان خوارد. کوڕی بەقیە نامەیەکی بۆ رۆکن ئەلدەولە نووسی و لەبارودۆخی خۆی و بەختیار ئاگاداری کردەوە. رۆکن ئەلدەولە بۆ ئەو و مەرزوبان و ئەو کەسانەی پشتیوانیان لەبەختیار دەکرد، نامەی نووسی و پێشنیاری خۆڕاگری پێکرد و ئەوانی ئاگادار کردەوە بەرەو عێراق بەرێدەکەوێت تا عیزەد ئەلدەولە لەوێ دوور بخاتەوە و بەختیار بۆ فەرمانڕەوایەتی بگەڕێنێتەوە.

سنوورەکانی ژێر فەرمانی عیزەد ئەلدەولە پەرێشان بوو و دوژمنان کاتێک زانییان باوکی، پشتیوانی ناکات، بوێر بوون و ئە سامانەی لەفارس و دەریا (کەنداوی فارس) بەدەستی دەگەیشت، دواکەوت و جگە لەبەغداد هیچ شوێنێکی بەدەستەوە نەما. خەڵکی گەڕەك و کۆڵانەکان چاوی تەماحیان تێبڕی و ئەوەی بینی کەهیچ کات پەسەندی نەدەکرد. عیزەد ئەلدەولە بەباشی زانی باوکی فەتح کوڕی عەمید لەگەڵ نامەیەك بۆ لای باوکی بنێرێت و لەبەسەرهاتی خۆی و بلاوبوونەوەی سامانەکان ئاگاداری کردەوە و باسی ناتەوانی بەختیاری بۆ بەرێوبردنی وڵات کرد. بۆ باوکی نووسی ئەگەر بەختیار بۆ فەرمانڕەوایەتی بگەڕێتەوە، هەم خەلافەت و هەم وڵات لەدەست دەچێت و لەناودەچن. داوای لێکرد چیتر هاوکاری بەختیار نەکات. عیزەد ئەلدەولە بەباوکی فەتحی وت: ئەگەر بەوتەکان رازی بوو، چ باشتر وەگەرنە پێی بڵێ عیزەد ئەلدەولە بەڵێنی رەوانە کردنی ساڵانە سی هەزار درهەم لەکەنارەکانی عێراق دەدات و بەختیار و کەسەکانی بۆ لای تۆ دەنێرێت تا سەرپشکیان بکەیت ئەگەر دەخوازن لای تۆ بمێننەوە و ئەگەر خوازیاری فەرمانڕەوایەتی یەکێك لەشارەکانی فارس بن، ئەو شارەیان پێ دەسپێرم و ئەگەر دەخوازیت خۆت کاروباری عێراق بگرەدەست و بەختیار بۆ رەی بنێرە و من دەگەرێمەوە بۆ فارس. فەرمان، فەرمانی تۆ دەبێت.

عیزەد ئەلدەولە بەکوڕی عەمیدی وت: ئەگەر رازی بوو چ باشتر وەگەرنە پێی بڵێ: ئەی سەروەر و باوك! بەداوەری و وتەی تۆ رازیم بەلام ناکرێت ئەم دەستەیە دوای ئاشکرا بوونی دوژمنایەتی رزگار بکرێت چوونکە دواتر بەهەموو هێز و توانایانەوە دژی من دەجەنگن و یەکیەتی لەناو دەچێت و ئەم بنەماڵەیە بۆ

هەمیشە یەکهەڵوێستی خۆیان لەدەست دەدەن. ئەگەر بەوتە و پێشنیارەکانم رازی بوویت، من ملکەچ و فەرمانبەرم و ئەگەر رازی نەبوویت و فەرمانی گەڕانەوەت پێدام، بەختیار و کەسەکانی دەکوژم و ئەوەی هاوکاری ئەوانی کردبێت، قۆلبەستی دەکەم و لەعێراق دووردەکەومەوە و بەجێی دەهێڵم تا بەدڵخوازی خۆت کەسێك وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان بکەیت.

کوڕی عەمید لەبردنی نامەکە ترسا و خوازیاری ئەوە بوو کەسێکی دیکە بڕواتە لای ڕۆکن ئەلدەولە و وتی ئەو بەدوای پەیك بەرێدەکەوێت و هاوشێوەی راوێژکارێك داوا لەرۆکن ئەلدەولە دەکات بەخواست وپێشنیارەکانی ناو نامەکە رازی ببێت. عێزەد ئەلدەولە نامەکەی بەکەسێکدا نارد و کوڕی عەمیدی بەدوای ئەودا بەچەندین وشتر ڕەوانە کرد.کاتێك پەیك گەیشتە بارەگای رۆکن ئەلدەولە و بەشێکی نامەکەی خوێندەوە، ڕۆکن ئەلدەولە پەلاماریدا تا خوێنی بڕێژێت بەڵام پەیك هەڵات. رۆکن ئەلدەولە کاتێك ئارام بوویەوە، پەیکەکەی گەڕاندەوە و پێی وت: بەفلأنەکەس (عێزەد ئەلدەولە) بەناوێکی دیکە بانگی کرد و جوێنی پێدا– بڵێ: تۆ بۆ هاوکاری برازاکەم چوویت و چاوی تەماحت بڕییە سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو. ئایا نازانیت من چەندین جار هاوکاری حەسەن کوڕی فیرزانم کرد کەبێگانەم بوو و گیان و وڵاتی خۆم بۆ هاوکاری کردنی ئەو خستە مەترسییەوە و کاتێك سەرکەوتنم بەدەست هێنا، وڵاتەکەیم بۆ گەڕاندەوە و درهەمێکم لێ وەرنەگرت. دواتر هاوکاری ئیبراهیم کوڕی مەرزوبانم کرد و فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجانم بۆ گەڕاندەوە و وەزیر و سوپاکەم بۆ هاریکاری ئەو نارد و یەك درهەمم لەویش وەرنەگرت. هەمووی ئەم کارانە بۆ بەدەست هێنانی ناو و نیشانی چاکە بوو وهەنووکە تۆ دەخوازیت بەدوو درهەم کەبۆ من و برازاکەمی تەرخان دەکەیت، منەتمان بکەیتەسەر و چاوی تەماح ببڕیتە سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو و بەکوشتنی ئەوان من دەترسێنیت.

پەیك گەڕایەوە و کوڕی عەمید گەیشتە بارەگای رۆکن ئەلدەولە. رۆکن ئەلدەولە مۆڵەتی سەردانی پێنەدا و گوێی لەوتەکانی ئەو نەگرت و هەڕەشەی کوشتنی لێکرد و پەیامی بۆ نارد کە: تۆ و عێزەد ئەلدەولە پشت گوێ دەخەم تا هەموو هێز

و توانای خۆتان بەکار ببەن. من بۆ جەنگی ئێوە نایەم مەگەر لەگەڵ سێسەد وشتر و سێسەد وشتر سوار. کەواتە ئەگەر دەخوازن خۆڕاگری بکەن. سوێند بەخوا دژی ئێوە ناجەنگم مەگەر بەهاوکاری نزیکترین کەسەکانی ئێوە.

رۆکن ئەلدەولە دەیوت: هەموو شەوێك مۆعیز ئەلدەولەی برام لەخەودا دەبینم کەپەنجەکانی خۆی دەگەزێت و دەڵێت: براکەم! بەم شێوەیە بەڵێنتدا سەرپەرەستی منداڵەکانی من بیت؟ رۆکن ئەلدەولە براکەی خۆش دەویست چوونکە رۆکن ئەلدەولە پەروەردەی کردبوو و رۆکن ئەلدەولە هاوشێوەی منداڵی ئەو بوو.

دواتر خەڵکان هەوڵیاندا لەنێوان کوڕی عەمید و رۆکن ئەلدەولە نێوەنجیگەری بکەن. ئەوان دەیانوت: کوڕی عەمید بەم نامە رازی بووە بۆ ئەوەی رێگە چارەیەك بێت بۆ رزگار کردنی ئەو لەدەستی عێزەد ئەلدەولە و گەیشتنی بەبارەگای تۆ تا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆ بێت. رۆکن ئەلدەولە مۆڵەتی سەردانی پێدا و گفتوگۆی لەگەڵ کرد. کوڕی عەمید بەڵێنیدا عێزەد ئەلدەولە بۆ فارس بگەڕێنێتەوە و بەختیار بۆ سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی عێراق گەڕاندەوە. رۆکن ئەلدەولە ئەوی بۆ لای عێزەد ئەلدەولە گەڕاندەوە و کوڕی عەمیدی لەخراپ بوونی بارودۆخ ئاگاداری کردەوە.

کاتێك عێزەد ئەلدەولە بینی هەموو شتەکان دژی ئەوە، رازی بوو بەوەی رێگەی فارس بگرێتەبەر و بەختیار بۆ فەرمانڕەوایەتی بگەڕێنێتەوە. ئەوی لەزیندان هێنایەدەر و خەڵاتی پێبەخشی و پەیمانی لێسەند جێگری ئەو لەعێراق بێت و بەناوی عێزەد ئەلدەولە وتار بخوێنێتەوە و لەبەر ناتەوانی بەختیار، براکەی، باوکی ئیسحاقی وەك فەرماندەی سوپا دەستنیشان کرد و دواتر ئەوەی لەو و کەسانی دەوروبەری سەندبوو، گەڕاندەوە و لەشەوال/ جونی ئەم ساڵە بەرەو فارس بەرێکەوت و فەرمانی بەباوکی فەتح کوڕی عەمید، وەزیری باوکیدا سێ رۆژ دواتر پەیوەستی ببێت.

کاتێك عێزەد ئەلدەولە ڕۆشت، کوڕی عەمید لای بەختیار مایەوە و بەخۆشی ژیانی بەسەر برد چوونکە بەختیار شەیدای رابواردن و خۆشی بوو. ئەم دووانە بەنهێنی پەیمانیان بەست هەرکات رۆکن ئەلدەولە، مرد، کوڕی عەمید وەك وەزیری

بەختیار دیاری بکرێت. ئەم هەواڵە بەعێزەد ئەلدەولە گەیشت وەك دواتر ئاماژەی پێدەدەین، بووە هۆکاری لەناوچوونی کوڕی عەمید.

بەختیار لەبەغداد مایەوە و پەیمانەکانی خۆی لەگەڵ عێزەد ئەلدەولە نەبردەسەر. کاتێك بارودۆخی بەختیار سەقامگیر بوو، کوڕی بەقیهی لەجیاتی نوێنەری عێزەد ئەلدەوله نارد و نوێنەری عێزەد ئەلدەولە هاتە بارەگای بەختیار. پەیوەندییەکانی نێوان بەختیار و عێزەد ئەلدەوله لێڵتر بوو. دوای ڕۆشتنی عێزەد ئەلدەولە شۆڕش ڕوویدا و کوڕی بەقیە دڵنەوایی سوپاکەی کرد و لەم ڕێگەوە سامانێکی زۆری لەخەزێنەکانی خۆی پاشەکەوت کرد و هەرکات بەختیار داوای پارەی لێدەکرد، سوپای بۆ وەرگرتنی ڕۆژانە هان دەدا. ئەم بارودۆخە بۆ بەختیار دژوار بوو، لەگەڵ کەسانی دەوروبەر ڕاوێژی کرد تا کوڕی بەقیە لەناو ببات. کوڕی بەقیە ئاگادار بوویەوە. ئەو ڕۆشتە لای بەختیار و سەرکۆنەی کرد. بەختیار حاشای لەم قسە کرد و سوێندی خوارد. چیتر کوڕی بەقیە خۆی لەو بەدوور دەگرت.

## ناسازگاری کرمانییەکان لەگەڵ عێزەد ئەلدەولە و گەڕانەوەی ئارامی وئاسایش

لەم ساڵەدا دانیشتووانی کرمان ڕێگەی ناسازگارییان لەگەڵ عێزەد ئەلدەولە گرتەبەر.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: پیاوێك لەجەرومیە- سەرزەمینێکی گەرمە- بەناوی تاهیر کوڕی سەممە، بەڵێنی کۆکردنەوەی سامانێکی زۆری بەعێزەد ئەلدەولەدا، بەڵام چاوی تەماحی بڕییە ئەم سامانە. عێزەد ئەلدەولە خۆی ڕۆشتبووە عێراق و وەزیرەکەی، موتەهەر کوڕی عەبدوللەی بۆ زاڵبوون بەسەر عەممان بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کردبوو. بەم شێوەیە کرمان سوپای تیا نەمابوو. تاهیر ئەم هەلەی قۆستەوە و پیاوانی جەرومییە و کەسانی دیکەی کۆکردەوە. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە.

بەرێکەوت یەکێك لەتورکە سامانییەکان بەناوی یوزتەمەر لەگەڵ باوکی حەسەن محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی سیمجور، فەرماندەی سوپای خوراسان لەلایەن سامانییەکانەوە، رێگەی ناسازگاری گرتەبەر. تاهیر نامەی بۆ نووسی و تەماحی گرتنی کەنارەکانی کرمانی خستە بەردەست. ئەو بۆ لای تاهیر بەرێکەوت و بڕیاریاندا یوزتەمەر فەرماندە بێت. خەڵکانی جەرومییە دژی یوزتەمەر ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ئەو گومانی کرد تاهیر ئەوانی هانداوە، لەبەر ئەمە ناسازگاری هاتە ئاراوە و کوشت و کوشتار دەستی پێکرد. یوزتەمەر سەرکەوتنی بەسەر تاهیر بەدەست هێنا و ئەسیری کرد. هەروەها سەرکەوتنی بەسەر هاوەڵانی ئەویش بەدەست هێنا.

حسەین کوڕی باوکی عەلی کوڕی ئەلیاس کە لەخوراسان بوو، لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و چاوی تەماحی بڕییە کرمان و دەستەیەکی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر ئەو ناوچەیە و لەوێش ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. دواتر موتەهەر کوڕی عەبدوللە دەستی بەسەر عەممان و کوێستانەکانی ئەو سەرزەمینەدا گرت و خارجییەکانی ئەو سەرزەمینەی لەناوبرد و گەڕایەوە. لەم کاتەدا نامەی عێزەد ئەلدەولەی لەبەغدادەوە بەدەست گەیشت کەداوای لێدەکرد بەرەو کرمان بڕوات. ئەو بەخێرایی رێگەی کرمانی گرتەبەر و لەرێگە رووبەڕووی خراپەکاران بوویەوە و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و هەڵی واسین و جەنازەکانی لەت لەت کرد و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشی کردەسەر یوزتەمەر. دوو سوپا لەکەنارەکانی شاری بەم رووبەرووی یەکبوونەوە. یوزتەمەر هەڵات و ڕۆشتە ناو شارەکە و موتەهەر لەقەڵایەك لەناو شارەکە گەمارۆی خستەسەر. ئەو داوای ئەمانی لەموتەهەر کرد و پێی بەخشرا. ئەو لەگەڵ تاهیر ڕۆشتە لای موتەهەر. موتەهەر فەرمانی سەربڕینی تاهیری دەرکرد. یوزتەمەریان بردە سەر بەرزایی یەکێك لەقەڵاکان و ئەمە کۆتایی کاری ئەو بوو. موتەهەر دواتر هێرشی کردە سەر حسەین کوڕی ئەلیاس بەڵام کاتێك ژمارەی زۆری سوپاکەی ئەوی بینی، ترسا و چیتر جگە لەرووبەروو بوونەوە هیچ چارەیەکی دیکەی نەمابوو. ئاگری شەڕێکی مەترسیدار بڵێسەی سەند و حسەین بۆ دەروازەی جیرۆفت هەڵات و سوپاکەی

هەڵاتن بەڵام دیواری شارەکە ڕێگەی هەڵاتنی لێ گرتن و بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆریان کوژران. حسەین ئەسیر کرا و ئەویان بردە لای موتەهەر. چیتر دوای ئەوە کەس ناوی حسەینی نەبیست و بارودۆخی کرمان بۆ عیزەد ئەلدەولە سەقامگیر بوو.

## زاڵبوونی فەتکین لەدیمەشق و بەسەرهاتی ئەو تا کاتی مردن

پێشتر ئاماژەماندا بەشکستی فەتکینی تورك، موالی مۆعیز ئەلدەولە کوڕی بویە بەدەستی بەختیار کوڕی مۆعیز ئەلدەولە و هەروەها سەبارەت بەعیزەد ئەلدەولە لەشۆڕشی تورکەکانی عێراق دووایین. کاتێك فەتکین تێکشکا، لەگەڵ دەستەیەك لەسەربازە شیاوەکانی لەسوپای تورك، خۆیان گەیاندە حیمس و لەنزیك ئەو شارە ئوردوویان لێدا. لەوێ زاڵم کوڕی مەوهوبی عەقیلی کە بەنوێنەرایەتی مۆعیز لدین الله، فەرمانڕەوای دیمەشق بوو، مەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوی کرد بەڵام نەیتوانی بیگرێت لەبەر ئەمە چاوی لەگرتنی ئەو پۆشی و گەڕایەوە و فەتکین بەرەو دیمەشق بەرێکەوت و لەنزیك شارەکە ئوردووی لێدا.

لەو کاتەدا ڕەییان، کۆیلەی مۆعیز، فەرمانڕەوای دیمەشق بوو و تازە پێگەیشتووان دەستیان بەسەر شارەکەدا گرتبوو. گەورەکانی شار لەم دەسەڵاتە بێ بەش و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان نەبوون. کاتێك فەتکین لەدەرەوەی شارەکە ئوردووی لێدا، گەورە و پیرەکانی شار ڕۆشتنە لای و خۆشحاڵی و ڕەزامەندی خۆیان لەهاتنی ئەو نیشاندا و داوایان لێکرد لایان بمێنێتەوە و شارەکە بخاتە ژێر فەرمانی خۆی و بەڵای میسرییەکان لەناو ببات چوونکە میسرییەکانیان بەهۆی جیاوازی باوەڕ و ستەمکاری کارگوزارەکانیان خۆش نەدەویست. ئەوان داوایان لەفەتکین کرد لەدەست ئەم تازە پێگەیشتووانە ڕزگاریان بکات و فەتکین بەخواست و داواکەیان ڕازی بوو. ئەوان بۆ فەرمانبەری کردن و هاوکاری کردنی سوێندیان خوارد و خۆی سوێندی خوارد پشتیوانیان لێ بکات و بەڵای تازەپێگەیشتووان لەسەر ئەوان نەهێڵێت. بۆ ئەم مەبەستە ڕۆشتە ناو شارەکە و ڕەییانی کۆیلەی دەرپەڕاند و چیتر نەیهێشت بەناوی مۆعیز وتار بخوێندرێتەوە و لەشەعبان/

ئاوریل بەناوی خەلیفە تائیع وتاری خوێندەوە. خراپەکارانی بەتەواوی سەرکوت کرد و ترسی خستە ناو دڵەکان. بەگشتی کاروبارەکانی ڕێکخست.

لەو کاتەدا عەرەبەکان دەستیان بەسەر کەنارەکان و دەوروبەری شارەکەدا گرتبوو.

فەتکین مەبەستی جەنگی ئەوانی کرد و هێرشی کردەسەریان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و بوێری و چاونەترسی خۆی نیشاندا. هەمووان دانیان بەو راستییەدا نا کەکەسێکی بوێر و چاونەترسە و بەم شێوەیە ئارامی باڵی بەسەر ئەو ناوچەیە کێشا و شوێنکەوتە و سامانەکەی فراوان و خەزێنەکانی ئاوەدان و پێگەی جێگیر بوو.

ئەو بۆ مۆعێز، لەمیسر، نامەی نووسی و ڕێگەی سازگاری گرتەبەر و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نیشاندا. مۆعێز سپاسی کرد و داوای لێکرد بڕواتە لای تا خەڵاتی پێببەخشێت و دووبارە وەك کارگوزاری خۆی لەو سەرزەمینە ڕەوانەی بکات. بەڵام فەتکین ئەوی بەکەسێکی بڕواپێکراو نەدەزانی و لەڕۆشتن خۆی بەدوور گرت. مۆعێز سوپای رازاندەوە و سەربازەکانی ئامادە و مەبەستی هێرش کردنە سەر فەتکینی کرد بەڵام لەناکاو نەخۆش کەوت و مرد. چەند و چۆنی مەرگی ئەو لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٣٦٥/٩٧٦ زایینی باس دەکەین. دوای ئەو کوڕەکەی عەزیز باللە جێگەی گرتەوە و بەمەرگی ئەو، فەتکین لەهێرشی میسرییەکان ئاسوودە و مەبەستی هێرش کردنەسەر سنوورەکانی عەزیزی لەکەنارەکانی شام کرد و ڕۆشتە سەیدا و گەمارۆی خستەسەر. سەیدا لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی کوڕی شێخ و سەرکردە مەغریبیی و زاڵم کوڕی مەوهوبی عەقیلی هاوڕێیەتیان دەکرد. فەتکین لەگەڵ ئەوان، کەژمارەیان فراوان بوو، جەنگی. ئەوان چاوی تەماحیان تێبڕی و بۆ ڕوویەروو بوونەوەی ریزیان بەست فەتکین وای نیشانداپاشەکشێ دەکات وئەوانی شوێن خۆی خست تا لەسەیدا دوورکەوتنەوە. دواتر بۆ جەنگی ئەوان گەڕایەوە و نزیکەی چوار هەزار کەسی لێ کوشتن.

دواتر چاوی تەماحی بڕییە عوکا و هێرشی کردەسەر و ڕێگەی تەبەرییەی گرتەبەر و ئەو سەرزەمینەیشی وەك سەیدا گرفتاری کوشتار و تاڵان کردن کرد و

بۆ دیمەشق گەڕایەوە.

کاتێك عەزیز لەم هەواڵانە ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ وەزیرەکەی یەعقوب کوڕی کلّس راوێژی کرد. یەعقوب پێی وت جەوهەر لەگەڵ سوپایەك بەرەو شام ڕەوانە بکات. عەزیز سوپایەکی بۆ رازاندەوە و بەڕێی کرد. فەتکین کاتێك لەهاتنی سوپاکەیان ئاگادار بوویەوە، خەڵکانی دیمەشقی کۆکردەوە و وتی: ئێوە دەزانن ئەگەر من فەرمانڕەوایەتی ئێوەم گرتەدەست، تەنیا لەبەر رەزامەندی ئێوە بووە و گەورە و بچوکتان داوای ئەو کارەتان لێکردم. من رێبوارێك بووم و ئەم بەدبەختییە سێبەری بەسەر ئێوەدا دروست کردبوو، هەنووکە لەناو ئێوە دەڕۆم تا نەبمە هۆکاری زیان گەیاندن و ئازار بەئێوە. وتیان: رێگە نادەین لێمان دوور بکەویتەوە و لەرێگەی تۆدا گیان و سامانی خۆمان دەبەخشین و هاوکاریت دەکەین. فەتکین سوێندی وەفاداری پێخواردن. ئەوان سوێندیان خوارد و ئەو مایەوە. جەوهەر لەزیقەعدەی ٣٦٥/ جولای ٩٧٦ زایینی گەیشتە دیمەشق و گەمارۆی خستەسەر. جەنگی دژی فەتکین بەدژوار زانی. ئەم جەنگە دوو مانگ درێژەی کێشا و ژمارەیەکی فراوان لەهەردوو سوپا کوژران.

کاتێك خەڵکانی دیمەشق بینیان مانەوەی مەغربییەکان درێژەی کێشاوە، داوایان لەفەتکین کرد نامە بۆ حەسەن کوڕی ئەحمەدی قەرەمتی بنووسێت و داوای هاوکاری لێبکات. فەتکین نامەی نووسی. قەرەمتی لەئەحساوە بەرێکەوت و کاتێك نزیك کەوتەوە، جەوهەر دیمەشقی بەجێهێشت لەترسی ئەوەی لەنێوان دوو دوژمن گرفتار نەبێت. جەوهەر حەوت مانگ لەو ناوچەیە مایەوە. قەرەمتی گەیشت و پەیوەستی فەتکین بوو. هەردووك شوێن جەوهەر کەوتن و لەدەرەوەی رەملە بەئوردووەکەی گەیشتنەوە. جەوهەر سامانەکەی بۆ عەسقەلان ناردبوو. لەنێوان دوو سوپا جەنگ روویدا. فەتکین و قەرەمتی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی شام و عەرەبەکان و کەسانی دیکەیان لەدەوری خۆیان کۆکردبوویەوە تا ئەو جێگەی ژمارەی سوار و پیادەکانی ئەوان نزیکەی پەنجا هەزار کەس بوو. ئەوان لەکەنار بووورای تەواحین، دابەزین. ئەم رووبارە لەسێ فەرسەنگی شارەکە بوو و دانیشتووان ئاوی پێویستیان لەم رووبارە هەڵدەگرت. فەتکین و قەرەمتی رێگەی

ئاوەکەیان لێگرتن. جەوهەر و سوپاکەی نیازمەندی ئاوی پاشەکەوت کراوی ئەنبارەکان بوون بەڵام بەسەندەی نەدەکرد، لەبەر ئەمە ڕێگەی عەسقەلانیان گرتەبەر. فەتکین و قەرەمتی لەوێ گەمارۆیان خستەسەر و گەمارۆکە درێژەی کێشا و خواردەمەنی و توێشووی ئەوان کەمی کرد. لەم کاتەدا کەزستان بوو گواستنەوەی پاشکەوتەکانی میسر و شوێنەکانی دیکە لەڕێگەی دەریاوە نەگەری نەبوو بەناچاری سوپاکەی جەوهەر دەستیان بەمردوو خواردن کرد و بەهای هەر پێنج ڕەتڵ نانی شامی بۆ یەك دیناری میسری بەرز بوویەوە.

جەوهەر نامەی بۆ فەتکین نووسی و پێشنیاری سازگاری و فەرمانبەری پێکرد و چەندین دیاری گرانبایی بۆ نارد. فەتکین ویستی ڕێگەی سازگاری بگرێتەبەر بەڵام قەرەمتی ڕێگەی لێگرت و لەمەترسییەکانی جەوهەر ئاگاداری کردەوە. بەم شێوەیە زیاتر لەپێش بارودۆخیان لەجەوهەر و سوپاکەی دژوار کرد و ئەوان مەرگیان بەچاوی خۆیان دەبینی. جەوهەر کەسی بۆ لای فەتکین نارد و خوازیاری بینینی ئەو بوو. فەتکین لێی نزیك بوویەوە، هەردووك سواری ئەسپ بوون و چاویان بەیەك کەوت. جەوهەر پێی وت: دەزانی ئەوەی ئێمەی کۆکردۆتەوە، پارێزگاری کردن لەئیسلام و ڕێز گرتن لەدینە. ئەم شۆڕشە درێژەی کێشاوە و هەزاران کەسی تیا کوژراوە و سامانەکان تالآن کراوە. بۆ ئەم کارە ئێمە لەبارەگای خواوەند بەرپرسیارین. من پێشنیاری سازان و فەرمانبەریم پێکردیت و چەندین دیاری گرانباییم بۆناردیت بەڵام تەنیا بەوتەی کەسێك رازی بوویت کەئاگری ئەم شەڕە خۆش دەکات، ڕێز لەخوا بگرە و بۆچوونی خۆت بەسەر هەوەسی کەسانی دیکە بسەپێنە.

فەتکین وتی: سوێند بەخوا لەراستی و دروستی راوێژ کردن بەتۆ بێ گومانم بەڵام توانای هاورێیەتی تۆم نییە، چوونکە منت بۆ هاورێیەتی قەرەمتی ناچار کرد و هەنووکە دەبێت گوێ لەوتەکانی ئەو بگرم.

جەوهەر وتی: ئەگەر بەو شێوەیە کەدەیڵێیت، لەوێوە کەباوەڕم بەئەمانەتداری تۆ هەیە و تۆ بەکەسێکی جوامێر دەزانم، وتەکانت بەراست لەقەڵەم دەدەم، بەڵام بارودۆخ لەئێمە دژوار بووە و دەمەوێت منەت بخەیتە سەر من و موسوڵمانان و

پەنامان بدەیت، تا بەسپاس کردنی تۆ بۆ لای سەروەری خۆم بگەڕێمەوە. ئەگەر ئەو کارە بکەیت، موسوڵمانان بۆ چاکەکاری کۆدەکەیتەوە.

فەتکین بەداواکەی رازی بوو و سوێندی وەفاداری خوارد و بۆ لای قەرەمتی گەڕایەوە و لەبەسەرهاتەکە ئاگاداری کردەوە. قەرەمتی وتی: کارێکی نەشیاوت کرد. جەوهەر پیاوێکی بیرمەند، دوورئەندێش و فێڵبازە. ئەگەری هەیە بۆ لای عەزیز باللە بگەڕێتەوە بەڵام بەزووترین کات بەسوپایەکی گەورەتر هێرش دەکاتە سەرمان کەتوانای خۆراگریمان نابێت. باشتر وایە لەپەیمانەکەی خۆت پەشیمان ببیتەوە تا لەبرسیەتی بمرن و دواتر شمشێر دەخەینە ناو پاشماوەی سوپاکەی.
فەتکین بەوتەکانی رازی نەبوو و وتی: فێڵی لێ ناکەم و مۆڵەتی بەجەوهەر و سوپاکەیدا رێگەی میسر بگرنەبەر. جەوهەر بۆ لای عەزیز باللە گەڕایەوە و کاتێک گەیشت، لەتەواوی رووداوەکە ئاگاداری کردەوە و وتی: ئەگەر مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەوانت هەیە، خۆت بەرێکەوە وەگەرنە بەدوای من دەگەنە ئێرە. عەزیز خۆی هاتە پێش و سامانێکی زۆری بڵاو کردەوە و لەگەڵ جەوهەری فەرماندەی سوپاکەی بەرێکەوت.

فەتکین و قەرەمتی لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە و هەردووک بۆ رەملە گەڕانەوە. عەرەبەکان و کەسانی دیکەیان کۆکردەوە. عەزیز گەیشت و لەدەرەوەی رەملە ئوردووی لێدا. فەتکین و قەرەمتی لەنزیک ئەو دابەزین و لەموحەرەمی ٣٦٧/ ئۆگۆستی ٩٧٧ زایینی ریزیان بەست. عەزیز بوێرییەکی ئەوتۆی لەفەتکین بینی، سەریسوڕما. پەیکی بۆ لای ئەو نارد و پێشنیاری فەرمانبەری پێکرد و بەڵێنیدا ئەگەر ملکەچی خۆی نیشان بدات، خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی پێدەبەخشێت و سەرزەمینەکان دەخاتە ژێر فەرمانی ئەو و وەك فەرماندەی سوپاکەی دەستنیشانی دەکات و جڵەوی هەموو کاروبارەکانی وڵاتەکەی بەو دەسپێرێت. داوای لێکرد بڕواتە لای و گوێ لەوتەکانی بگرێت. فەتکین لەبەردەم ریزی دوو سوپا لەئەسپەکەی دابەزی، سەری کوڕنوشی دانەواند و بەپەیکی وت: بەسەروەری باوەڕداران بڵێ: ئەگەر پێشتر ئەم بەڵێنەت دەدا، بۆ پەیوەست بوون بەتۆ ئەسپم غاردەدا و ملکەچی خۆم بۆ فەرمانەکانت نیشان دەدا بەڵام هەنووکە جگە لەجەنگ

هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە. ئەو هێرشی کردەسەر باڵی چەپی سوپاکەی عەزیز و تێکیشکاند و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن. عەزیز کاتێك ئەمەی بینی، فەرمانی هێرشی بەدڵی سوپاکەی و باڵی راستدا و بەم هێرشە فەتکین و قەرەمتی رێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. مەغربییەکان شمشێریان خستە ناویان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. خوێنی نزیکەی بیست هەزار کەسیان ڕشت.

عەزیز لەخێوەتەکەی دانیشت و سەربازەکان، ئەسیرەکانیان دەبردە لای. هەرکەس ئەسیرێکی دەبرد، خەڵاتی دەکرد. عەزیز فەرمانیدا جاڕ بدەن هەرکەس فەتکین بباتە لای، سەد هەزار دیناری پێدەدات. فەتکین کەرێگەی هەڵاتنی گرتبووەبەر، تینویەتی تەنگی پێهەڵچنی. لەم کاتەدا مەفرەج کوڕی دەغفەلی تائی کە لەکۆنەوە هاورێی یەکبوون، فەتکینی بینی. فەتکین داوای ئاوی لێکرد و پێیدا و بردییەوە بۆماڵەکەی خۆی و رێزی گرت بەڵام لەلایەکی دیکە ڕۆشتە لای عەزیز باللە و ئەوی لەگرتنی فەتکین ئاگادار کردەوە و داوای خەڵاتەکەی کرد. عەزیز خەڵاتەکەی پێبەخشی و کەسانێکی لەگەڵ نارد تا فەتکین بگرن. کاتێك فەتکین گەیشتە لای عەزیز، دڵنیابوو لەوەی دەستبەجێ دەیکوژێت بەڵام بینی عەزیز بەرادەیەك دڵنەوایی کرد کەناچار سەری کوڕنوشی دانەواند. عەزیز فەرمانیدا خێوەتێکی بۆ هەڵبدەن و ئەو کەسانەی پێشتر خزمەتیان دەکرد، بۆی گەڕاندەوە و گۆڕانکاری لەپێگەی رابردووی نەکرد. بەرادەیەك پارە و دیاری خستە بەردەم فەتکین کەپێشتر هاوتای نەبینراوە. ئەوی لەگەڵ خۆی بردە میسر و کردی بەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆی.

حەسەنی قەرەمتی بەهەڵاتن خۆی گەیاندە تەبەرییە کەنێردراوی عەزیز پێی گەیشتەوە و لەپەیامەکەی عەزیز ئاگاداری کردەوە: داوای لێکردبوو تا بڕواتە لای بۆ ئەوەی رێزی بگرێت و زیاتر لەفەتکین چاکەی لەگەڵ بکات. ئەو نەگەڕایەوە. عەزیز بیست هەزار دیناری بۆ نارد و ئەم بڕەی وەك بڕە پارەی ساڵانەی ئەو دیاریکرد. هەموو ساڵێك بیست هەزار دیناری بۆ دەنارد. قەرەمتی بۆ ئەحسا گەڕایەوە.

کاتێك عەزیز گەڕایەوە بۆ میسر، فەتکینی لەکۆشکەکەی جێگە کردەوە. پێگەی

فەتکین بەرز بوویەوە و خۆپەسەندی کردە پیشە و شانازی بەسەر وەزیرەکەی عەزیز، یەعقوب کوڕی کلّس کرد و چیتر نەدەڕۆشتە لای. بەمشێوەیە دوژمنایەتی لەنێوانیاندا دروست بوو. یەعقوب کەسێکی راسپارد تا ژەهرخواردی بکات و بەم شێوەیە فەتکین مرد. عەزیز لەمەرگی ئەو خەمبار و گومانی لەوەزیرەکەی کرد و لەبەر ئەمە چل و چەند رۆژ زیندانی کرد و پێنسەد هەزار دیناری لێسەند بەلاّم لەبەر ئەوەی بەزیندانی کرانی وەزیر کاروبارەکان لەجوولە کەوت، عەزیز ئەوی بەخشی و دووبارە بۆ وەزارەتی گەڕاندەوە.

## بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا حاجییەکان ڕۆشتنە سومەیرا و هیلالی مانگی زیحەجە/ دوانزەی ئۆگۆستیان لەوێ بینی. نەریت وابوو مانگ لەرۆژی چوارەم دەبینرا. لەم ناوەدا هەواڵیان پێگەیشت تا ئەو کاتەی دەگەنە غومەرە، ئاو نابینن و لەغومەریش ئاو کەمە و دووری رێگە تا ئەو ناوچە بیست رۆژە، بەناچاری بۆ مەدینە گەڕانەوە و لەوێ چاوەڕوان بوون و دواتر ئەو شارەیان بەجێهێشت (نەڕۆشتنە مەککە) و لەسەرەتای موحەرەم/ بیست و یەکی سێپتامبەر لەکوفە بوون.

لەم ساڵەدا ئەستێرەیەکی گەورە لەرۆژهەلاّتی ئەفریقییە دەرکەوت کەکلك و رووناکییەکی سەرنج راکێشی بوو. نزیکەی یەك مانگ دەبینرا. دواتر دیارنەما و چیتر کەس نەیتوانی بیبینێت.

لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەبدسەلام کوڕی باوکی موسا، مەخرەمی سۆفی، دانیشتووی مەککە کەهاونشینی باوکی عەلی روودباری و کەسانی وەك ئەو بوو، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و پێنجی کۆچی ( ٩٧٥و٩٧٦ زایینی )

## مەرگی مۆعیزلدینی عەلەوی و فەرمانڕەوایەتی عەزیز باللە ی کوڕی

لەم ساڵەدا مۆعیزلدین الله باوکی تەمیم مەعد کوڕی مەنسور باللە ئیسماعیل کوڕی قائیم بامر الله باوکی قاسم محەممەد کوڕی مەهدی باوکی محەممەد عوبەیداللەی عەلەوی ئەلحەسەنی لەمیسر مرد. دایکی، دایکی منداڵ بوو. مەرگی ئەو لەحەڤدەی ڕەبیع الاخری ئەم ساڵە/ بیست و پێنجی دیسامبەری ٩٧٥ زایینی ڕوویدا. ئەو لەیانزەی ڕەمەزانی ٣١٩/ بیست هەشتی سێپتامبەری ٩٣١ زایینی لەئەفریقییە چاوی بەدنیا هەڵهێنا و ساڵەکانی ژیانی لەچل و پێنج ساڵ و شەش مانگ کۆتایی پێهات.

چۆنیەتی مەرگی ئەو بەم شێوە بوو: پاشای ڕۆم لەقوستەنتەنییە پەیکی بۆ لای ئەو نارد کەبەردەوام بۆ ئەفریقییە هاتوچۆی دەکرد. مۆعیز ڕۆژێك لەتەنیاییدا پێی وت: ئایا بیرتە ئەو ڕۆژەی هاوشێوەی پەیك هاتیتە مەهدییە بۆ لای من و پێم وتی: ڕۆژێك دێیتە لای من کەفەرمانڕەوای میسر دەبەم؟ پەیك وەڵامی دایەوە: بەڵێ. مۆعیز پێی وت: ڕۆژێك لەبەغداد دێیتە لای من ئەو کاتەی لەسەر تەختی خەلافەت دانیشتووم. نێردراو پێی وت: ئەگەر گیانم لەئەماندایە و تووڕە نابیت، ئەوەی لەدڵمدایە، باسی دەکەم. مۆعیز وتی: بڵێ تۆ لەئەماندایت. نێردراو وتی: ئەو ساڵەی پاشای ڕۆم منی بۆ بارەگای تۆ نارد، گەورەیی و ژمارەی فراوانی سوپاکەی تۆ بەشێوەیەك هاتە بەرچاوم ئەوەندەی نەمابوو لەترسا زیرە بکەم و کاتێك گەیشتمە کۆشکەکەی تۆ، ڕۆشناییەکی فراوانم بینی کەچاوەکانمی زەق کرد و کاتێك هاتمە لای تۆ، وەك ئافرێنەر هاتیتە بەرچاوم بەشێوەیەك ئەگەر دەتوت بەئاسماندا دەڕۆیت، باوەڕم بەوتەکانت دەکرد بەڵام ئەمڕۆ کە هاتمە لای تۆ، هیچیم لەوانەی پێشوو نەبینی، لەسەرەوە کەسەیری شارەکەی تۆم کرد، ڕەش و تاریك هاتەبەر چاوم و کاتێك هاتمە لای تۆ، هەستم بەپێگەی ئەو ساڵەت نەکرد. بەخۆم وت: ئەوەی بینیم تایبەت بەرابردوو بوو و هەنووکە بارودۆخ پێچەوانەی ئەو کاتەیە.

مۆعیز سەری داخست و نێردراو ڕۆشت. بەهۆی گفتوگۆی لەگەڵ نێردراو، گرفتاری تایەکی کوشندە بوو کەدەرئەنجام مەرگی ئەوی لێکەوتەوە.

مۆعیز بیست و سێ ساڵ و پێنج مانگ و دە ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەو دوو

ساڵ و نۆ مانگی لەمیسر و ساڵەکانی دیکەی لەئەفریقییە بەسەر برد. ئەو یەکەم خەلیفەی عەلەوی لەمیسر بوو رووی کردە ئەو سەرزەمینە و خستییە ژێر فەرمانی خۆی. مۆعێز شەیدای ئەستێرەناسی بوو و گوێی لەوتەی ئەستێرەناسەکان دەگرت. رۆژێك ئەستێرەناسێك پێی وت: لەفلاّنە کات زیانی پێدەگات و پێشنیاری کرد ژێرخانێك هەڵکەنێت و لەوێ خۆش بشارێتەوە تا ئەو کاتە بەسەر دەچێت. مۆعێز ئەو کارەی کرد و سەرکردەکانی خۆی کۆکردەوە و پێی وتن: لەنێوان من و خوا پەیمانێك هەیە و بۆ ئەنجامدانی دەڕۆم و کوڕەکەم نزار(عەزیز) وەك جێگر لەناو ئێوە بەجێدێڵم. گوێ لەوتەکانی بگرن و فەرمانەکانی ئەنجام بدەن.

ڕۆشتە ناو ژێرخانەکە. دواتر هەر کاتێك یەکێك لەمەغربییەکان هەورێکی دەبینی، بەگومانی ئەوەی مۆعێزی تێدایە، سلاّو و دروودی بۆ دەنارد. ئەو یەك ساڵ خۆی شاردەوە و دواتر خۆی ئاشکرا کرد و چەندین ساڵی دیکە ژیا تا ئەوەی نەخۆش کەوت و مرد. کوڕەکەی، عەزیز، مەرگی ئەوی تا جەژنی قوربان لەخەڵکان شاردەوە و لەم رۆژەدا لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند و وتارێکی بۆ خوێندنەوە و لەوتارەکەی ناوی خۆی هێنایە سەرزمان و پرسەی بۆ باوکی گێڕا.

مۆعێز پیاوێکی بیرمەند، بەخشندە و بوێر بوو. هاوشێوەی باوکی هەڵس و کەوتی دەکرد و دادپەروەری لەناو خەڵکان بلاّو دەکردەوە. ئەوەی پێشنیار و بانگەوازی بۆ دەکرد تەنیا لەکەسە نزیکەکانی خۆی نەدەشاردەوە و فەرمانی بەبانگەوازکەران دەدا تا جێگەیەك قسە بکەن نەبێتە هۆی سەرکۆنە کردن.

کاتێك عەزیز لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت، سوپا گوێڕایەڵی خۆی نیشاندا و بۆ فەرمانبردنی ئەو کۆك و سازگار بوون. ئەو لەکاتی مەرگی باوکی بەشێوەیەکی نهێنی کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد تا سەرئەنجام مەرگی باوکی ئاشکرا کرد. ئەوسا ڕێگەی رۆژئاوای گرتەبەر و ئەو دینارانەی لەناو خەڵکان بلاّو کردەوە کە بەناوی خۆی لێیدا بوو. یوسفی بولکینی وەك فەرمانڕەوای ئەفریقییە دەستنیشان کرد و سەرزەمینەکانی دیکە وەك تەرابلوس، سورت و ئەجدادییە کەباوکی عەزیز کەسانی دیکە جگە لەیوسفی وەك کارگوزاریان دیاریکردبوو، پەیوەستی سنووری فەرمانڕەوایەتی یوسف کرد. یوسف، کارگوزارەکانی خۆی بۆ ئەو سەرزەمینانە نارد و لەو کاتەدا پێگەی بەرز بوویەوە و سنووری دەسەلاّتی عەزیز ترسی لەسەر نەما.

یوسف خۆپەسەندی و خۆبینی کردە پیشە و بۆ ریاکاری ملکەچی فەرمانەکان بوو. هیچ بەرەژەوەندییەك لەپشتی دەسەڵاتەکەی ئەو بەدی نەدەکرا.

## جەنگی یوسفی بولکین لەگەڵ زەناتییەکان و کەسانی دیکە لەئەفریقییە

لەم ساڵەدا خەزرون کوڕی فەلفول کوڕی خزری زەناتی دەستەیەکی فراوانی کۆکردەوە و ڕێگەی سەجلماسەی گرتەبەر. فەرمانڕەوای ئەو شارە لەرەمەزان/ مەی ڕووبەڕووی بوویەوە و خەزرون، ئەوی کوشت و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و سامان و توێشووی زۆری لەو شارە کۆکردەوە. سەری کارگوزاری بۆ شاری ئاندۆلۆس نارد و بەم شێوەیە جارێکی دیکە زەناتییەکان سەریان بەرز کردەوە و فەرمانڕەوایەتییان گرتەدەست.

لەم کاتەدا بولکین لەنزیك سەبتە بوو. ئەو ڕۆشتە فاس و سەجلماسە و سەرزەمینی هەبت و ئەو شارانەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە و کارگوزارانی منداڵەکانی ئومەییەی لەو ناوچانە دەرپەڕاند. زەناتییەکان هەڵاتن و ژمارەیەکی زۆریان پەنایان بۆ سەبتە برد. سەبتە لەژێر فەرمانی ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆسدا بوو. ڕێگەکەی بەرادەیەك دژوار بوو کەگوزەر کردن و ڕۆشتن بەرەو ئەوشارە بەنەکران دەهاتە بەرچاو. بولکین فەرمانیدا دارەکان بڕن و گەونەکان بسووتێنن تا ڕێگە بۆ سوپاکەی بکرێتەوە.

بولکین بەرێکەوت و لەسەر چیایەکی بەرز دەیڕوانییە سەر شارەکە (سەبتە). نیو ڕۆژ سەیری کرد بۆ ئەوەی بزانێت گەمارۆ بخاتە سەر کام بەشی شارەکە و لەکوێوە ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنێت. لەدواهاتی ئەم کارەی ئەوەی دەستکەوت کەجگە لەکەشتی هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکەی نییە. دانیشتووانی سەبتە ترسێکی گەورەیان لای بولکین دروست کرد. ئەو بۆ بەسرە گەڕایەوە. بەسرە شارێکی جوان بوو لەمەغریب کە بەبەسرە ناوی دەبرا. کاتێك زەناتییەکان لەڕۆشتنی ئەو بۆ بەسرە ئاگادار بوونەوە، بەرەو دەشتەکانی ڕۆژئاوا هەڵاتن. بولکین گەیشتە بەسرە. فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس ئەم شارەی ئاوەدان کردبوویەوە. فەرمانیدا شارەکە وێران و دەست بەسەر سامانەکانیدا بگرن و دواتر ڕێگەی بەرغەواتەی گرتەبەر.

فەرمانڕەوایەك بەناوی عەبەس كوڕی دایكی ئەنسار فەرمانڕەوایەتی بەرغەواتەی دەكرد كەپیاوێكی جادووگەر بوو و بانگەشەی پێغەمبەری دەكرد. فەرمانەكانی لەلایەن خەڵكانەوە ئەنجام دەدرا. ئایینێكی تازەی بۆ ئەوان هێنابوو. بولكین رووبەرووی بوویەوە و چەندین شەڕی قورس لەنێوان دوو سوپا روویدا و سەرئەنجام بولكین سەركەوتنی بەدەست هێنا و خواوەند، عەبەس كوڕی دایكی ئەنساری لەناو برد و سوپاكەی رووبەرووی شكست بوویەوە و بەشێوەیەكی ریسوایانە لەناو خاك و خوێندا گەوزان. ژمارەیەكی فراوان لەژن و منداڵەكانیان ئەسیر كران. بولكین هەموویانی بۆ ئەفریقییە نارد. دانیشتووانی ئەفریقییە دەیانوت تا ئێستا ئەوەندەیان ئەسیر نەبینیوە. یوسفی بولكین لەو سنوورە مایەوە و فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست. سەبەتییەكان لێی دەترسان و زەناتییەكان بۆ ریخەڵانەكان هەڵاتبوون تا ئەوەی ساڵی ٩٨٣/٣٧٣ زایینی دەستی پێكرد.

## گەمارۆدانی كەسەنتە

لەم ساڵەدا فەرمانڕەوای سەقەلییە (سیسیل)، باوكی قاسم كوڕی حەسەن كوڕی عەلی كوڕی حسەین، لەگەڵ سوپایەك لەموسوڵمانان و ژمارەیەك لەپیاوچاكان و شارەزایانی دین لەمانگی رەمەزان/ مەی هێرشی كردە سەر مەسینی. دوژمن هەڵات. موسوڵمانان هێرشیان كردە سەر كەسەنتە و چەند رۆژێك گەمارۆیان خستەسەر. دانیشتووانی شارەكە داوای ئەمانیان كرد و باوكی قاسم پێی بەخشین و بڕێك پارەی لێ وەرگرتن و لەوێوە رێگەی قەڵای جەلوای گرتەبەر و ئەم بەڵایشی بەسەر دانیشتووانی ئەو قەڵایە هێنا. فەرمانی بەقاسمی برایدا بەكەشتی بەرەو بەربولە بەرێكەوێت و دەستە جەنگییەكانی خۆی لەسەرزەمینی قەلورییە بڵاو بكاتەوە. قاسم ئەو كارەی كرد و تالانی زۆری كۆكردەوە و ژمارەیەكی كوشت و ژمارەیەكی ئەسیر كرد و لەگەڵ براكەی بۆ شارەكە گەڕایەوە.

لەساڵی ٩٧٦/٣٦٦ زایینی، باوكی قاسم فەرمانی ئاوەدان كردنەوەی رەمتەی دا. ئەم شارە پێشتر وێران كرابوو. ئەو دووبارە جەنگی تاقی كردەوە، سوپای ئامادە كرد و ڕۆشتە قەڵای ئەغاسە. دانیشتووانی قەڵاكە داوای ئەمانیان كرد و

پێیان بەخشرا و لەبەرابەردا، قەڵاکە و سامانی ناو قەڵاکەیان تەسلیم کرد. باوکی قاسم ڕێگەی تارەنتی گرتەبەر و بینی خەڵکان دەرگاکانیان بەستووە و هەڵاتوون. سوپاکەی بەدیوارەکەدا سەرکەوتن و دەروازەکانیان کردەوە و ڕۆشتنە ناو شارەکە. باوکی قاسم فەرمانی وێران کردنی شارەکەیدا. شارەکەیان وێران کرد و سووتاندیان. دواتر چەندین دەستەی لەسوپاکەی ڕەوانە کرد. ئەم دەستانە گەیشتنە ئەزەرەنت و کەنارەکانی دیکە. خۆی ڕۆشتە عەردیلە و ڕووبەڕووی خەڵکەکەی بوویەوە. خەڵکی ئەم شارە پارەیان پێدا تا پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ ببەستێت. پەیمانی ئاشتی واژۆ کرا و باوکی قاسم گەڕایەوە.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بۆ عەزیزی عەلەوی لەمەککە وتاریان خوێندەوە. ئەمە دوای ئەوە بوو کەسوپای بۆ مەککە نارد و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و بارودۆخی لەدانیشتووانەکەی دژوار کرد و ڕێگەی نەدا خواردەمەنی بەو شارە بگات. لەبەر ئەمە گرانی لەشارەکە دەرکەوت و گرفتاری بەرۆکی خەڵکانی گرت.

لەم ساڵەدا بەسیلوس، کوڕی ئەرمانوس، پاشای ڕۆم، وەرد ناسراو بەسەقلاروسی دوموستوقی وەك فەرمانڕەوا دیاری کرد. کاتێك سەقلاروس لەسنوورەکەی فەرمانڕەوایەتی خۆی جێگیر و بەهێز بوو، پەیوەندییەکانی لەگەڵ پاشای ڕۆم پچڕاندو ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و داوای هاوکاری لەباوکی تەغلەب کوڕی حەمدان کرد و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری ئەو و تاجی کردەسەر و بیری لەگرتنی وڵات دەکردەوە.

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد کوڕی عودەی جورجانی کەپێشەوایەکی ناودارە، لەمانگی جومادی الاخرە/ فەوریە مرد. محەممەد کوڕی بەدری گەورەی حومامی، کۆیلەی کوڕی تولون کەدوای باوکی فەرمانڕەوایەتی فاسی دەکرد، کۆچی دوایی کرد.

لەزیقەعدە/ جولای ئەم ساڵە، سابت کوڕی سەنان کوڕی سابت کوڕی قورەی سابی مێژوونووس، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و شەشی کۆچی ( ٩٧٦و٩٧٧ زایینی )

### مەرگی ڕۆکن ئەلدەولە و هاتنە سەرکاری عێزەد ئەلدەولە

لەموحرەم/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە، ڕۆکن ئەلدەولە باوکی عەلی حەسەن کوڕی بویە مرد و کوڕەکەی، عێزەد ئەلدەولەی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

سەرەتای نەخۆشی ڕۆکن ئەلدەولە ئەو کاتە بوو بیستی بەختیاری کوڕی براکەی، مۆعێز ئەلدەولە، قۆڵبەست کراوە، ئەو کاتەی عێزەد ئەلدەولە دوای ئازاد کردنی بەختیار – ئامارژەمان پێدا– لەبەغداد گەڕایەوە.

توڕەیی باوکی، ڕۆکن ئەلدەولە بۆ هەمووان وکەسە نزیکەکان ئاشکرا بوو. ئەو ترسا نەوەك باوکی لەتوڕەییدا بمرێت و فەرمانڕەوایەتی لەناو بچێت و چیتر کەس گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبێت، لەبەر ئەمە پەیکی بۆ لای باوکی فەتح کوڕی عەمید، وەزیری باوکی نارد و داوای لێکرد لەنێوان ئەو و باوکی نێوەنجیگەری بکات. باوکی فەتح هەوڵەکانی خۆی خستەگەڕ و ڕۆکن ئەلدەولە کەئاگری توڕەیی دامرکایەوە، بەخواست و داواکەی ڕازی بوو و لەڕەی، بەرەو ئیسفەهان بەڕێکەوت و لەجومادی الاوەلی ٣٦٥/ ژانویەی ٩٧٦ زایینی گەیشتە ئەو شارە و لەفارسەوە، عێزەد ئەلدەولەی کوڕی بانگ کرد و مناڵەکانی دیکەیشی لەئیسفەهان کۆکردەوە. باوکی عەمید کوڕی فەتح دانیشتنێکی گەورەی ڕێکخست کەڕۆکن ئەلدەولە و کوڕەکانی و سوپاییەکان ئامادە بوون.

کاتێك دەستیان لەخواردن هەڵگرت، ڕۆکن ئەلدەولە، عێزەد ئەلدەولەی کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و کوڕەکەی دیکەی، فەخر ئەلدەولە باوکی حەسەن عەلی، وەك فەرمانڕەوای هەمەدان و کەنارەکانی کوێستان و مۆئەییەد ئەلدەولەی وەك فەرمانڕەوای ئیسفەهان و کەنارەکانی دەستنیشان کرد بەڵام هەردووکیانی خستە ژێر فەرمانی عێزەد ئەلدەولەی برایان.

لەم ڕۆژەدا عێزەد ئەلدەولە بەخەڵکانی دیکە جل و بەرگی دەیلەمی بەخشی و سەرکردەکان و براکانی وەك نەریتی ئایینی خۆیان لەگەڵ پاشاکان، گوڵی

بۆنخۆشیان پێشکەش کرد. رۆکن ئەلدەولە داوای لەکوڕەکانی کرد هاودەنگ و هاوقسە بن و بیری لەناسازگاری نەکەنەوە. دواتر خەڵاتی بەهەموویان بەخشی.

رۆکن ئەلدەولە لەرەجەب/ فەوریە لەئیسفەهان بەرەو ڕەی گەڕایەوە و نەخۆشییەکەی پەرەی سەند و سەرئەنجام کوشتی. بەمەرگی ئەو دین و دنیا لەبەر کۆبوونەوەی هەموو چاکییەکان لەودا، پرسەگێڕ بوو (؟!) ساڵەکانی ژیانی لەحەفتا کۆتایی پێهات و چل و چوار ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## وتەیەك سەبارەت بەبەشێك لەکردەوەکانی ئەو

رۆکن ئەلدەولە پیاوێکی خۆڕاگر و بەخشندە بوو، بۆ خەڵك و سوپاکەی، ولاتدار، خۆشەویست و دادپەروەر لەکاتی داوەری و نەفس بەرز بوو، خۆی لەستەم و ستەمکاری بەدوور دەگرت و رێگەی نەدەدا هاوەڵانیشی ستەمکاری بکەنە پیشە وسەبارەت بەکوشتن و خوێن ڕشتن، خۆپارێز و پارێزگاری کردنی لەمرۆڤەکان بەئەرکی سەرشانی خۆی دەبینی مەگەر ئەو کاتانەی هیچ رێگە چارەیەکی لەبەردەم نەبوایە. پشتیوانی بنەماڵە گەورەکان ورۆژانەی بۆ دیاری دەکردن، ئابڕوی ئەوانی دەپاراست و لەمانگەکانی رەمەزان، بۆ نوێژ خوێندن رووی لەمزگەوت دەکرد، ستەمەکانی رابردووی قەرەبوو دەکردەوە و بەڵێنی پێدانی پارەیەکی زۆری بەعەلەوییەکاندا و سامانێکی فراوانی لەناو هەژار و نەدارەکان بلاو کردەوە. لەگەڵ کەسە نزیکەکان بەشێوەیەکی نەرم هەڵس و کەوتی دەکرد. یەکێك لەهاوەڵانی سەبارەت بەم کردارەی لەگەڵی دوا و توندوتیژی مەرداویجی لەگەڵ کەسەکانی بیرهێنایەوە. رۆکن ئەلدەولە وتی: ئایا نەتبینی چۆن لەناوچوو و تەنانەت نزیکترین هاوەڵانی لەبەر توند و تیژییەکانی دژی ئەو شۆڕشیان کرد، بلام بڕوانە من لەبەر ئەم کردارەم (نەرمی نواندن) چۆن بەئارامی لەناو خەڵکان ژیان بەسەر دەبەم.

لەو دەگێڕنەوە: رۆژێك لەکاتی سەفەر ڕۆشتە خێوەتێك کەپێش هاوەڵانی بۆ ئەویان هەڵدابوو. کاتێك خواردنیان بۆ هێنا، بەیەکێك لەهاوەڵانی وت: بۆ لەمەتەڵ دەڵێن باشترینی شتی گوند، فەرمانڕەوایەتییە؟ هاورێکەی پێی وت: لەبەر ئەوەی

تۆ لەخێوەتەکەت دانیشتوویت و خواردنت لەبەردەمدایە بەڵام من نەخێوەتم هەیە نەخواردن. ڕۆکن ئەلدەولە پێکەنی و خێوەت و خۆراکەکەی بەودا. ئەمەیە کرداری پەسەند و شیاو.

ڕۆکن ئەلدەولە لەبەسەرهاتەکەی بەختیاریش ناو ونیشانێکی چاکەی لەخۆی بەجێهێشت کەبەڵگەیە بۆ وەفاداری و ڕێز گرتن لەپەیمان. خواوەند لێی ڕاز بێت. ئەو خاوەن بەڵێن و پشتی نەدەکردە کەس.

## ڕۆشتنی عیزەد ئەلدەولە بۆ عێراق

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە سوپای کۆکردەوە ورێگەی عێراقی گرتەبەر چوونکە ئاگادار ببوویەوە حەسنەوییەی کوردی، فەخر ئەلدەولە کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە، باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان، عیمران کوڕی شاهین و دەستەیەکی دیکە لەگەڵ بەختیار و کوڕی بەقیە ڕێگەی سازگارییان گرتۆتەبەر و بۆ دژایەتی کردنی عێزەد ئەلدەولە، پەیمانیان بەستووە و خراپەی ئەو دەهێننە سەرزمان. لەلایەکی دیکە عێزەد ئەلدەولە بۆ هێرش کردنەسەر عێراق، جوانی ئەم سەرزەمینە و پانتاییەکەی لەبەرچاو گرتبوو.

بەختیار بۆ ڕووبەروو بوونەوەی عێزەد ئەلدەولە، ڕێگەی واستی گرتەبەر. حەسنەوییە بەڵێنی پێدا بوو هاوکاری بکات. باوکی تەغلەبیش بەهەمان شێوە بەڵام هیچ کام پەیمانەکەیان نەبردەسەر. بەختیار بەراوێژ کردن لەگەڵ کوڕی بەقیە بەرەو ئەهواز بەرێکەوت و عێزد ئەلدەولە لەفارسەوە شوێنیان کەوت و لەزیقەعدە/ جون بەیەك گەیشتن و ڕووبەرووی یەکبوونەوە. ژمارەیەك لەسوپاییەکانی بەختیار لێی جیابوونەوە و پەیوەستی سوپاکەی عێزەد ئەلدەولە بوون. بەختیار شکستی خوارد و دەستیان بەسەر سامانی خۆی و کوڕی بەقیەدا گرت و کاڵا و کەل و پەلەکانیان تاڵان کرا. کاتێك بەختیار گەیشتە واست، کوڕی شاهین، فەرمانڕەوای بوتەیحە، سامان و کەرەستەی جەنگ و دیاری گرانبایی بۆ نارد. بەختیار ڕۆشتە لای شاهین. شاهین ڕێزی گرت و پارەیەکی زۆری خستە بەردەست. خەڵکان لەم کارەی شاهین سەریان سوڕما چوونکە وتبووی: بەختیار بەزوویی دێتە بارەگاکەی

مـن و داوای پـەنا دەکـات. پێشبینییەکەی راسـت بـوو. بـەختیار دووبـارە رێگـەی واسێتی گرتەبەر.

عێـزەد ئەلدەولـە سـوپایەکی بـەرەو بەسـرە ڕەوانـە کـرد و فەرمانڕەوایـەتی ئـەو شارەی گرتەدەست. هۆکاری لـەم کـارە ئـەوە بـوو دانیـشتووانی ئـەم شـارە دژایـەتی یـەکیان دەکـرد. هـۆزی مـوزێر بـەهۆی کـەین و بـەینی نێوانیـان پەیوەسـتی عێـزەد ئەلدەولـە بـوون و رەبیعـە ناسـازگاری ئـەوانیان دەکـرد و لەبـەر ئەمـە پەیوەسـتی بـەختیار بـوون. کاتێـک بـەختیار شکـستی خـوارد، هـۆزی رەبیعـە سـست و موزێرییـەکان بـەهێز بـوون. موزێرییـەکان نامـەیان بـۆ عێـزەد ئەلدەولـە نووسـی و داوایـان کـرد سـوپایەک ڕەوانـە بکـات. عێزەد ئەلدەولـە سـوپایەکی ڕەوانـە کـرد و شارەی بەسرەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و لای موزێرییەکان مایەوە.

بەختیار لەواسێت نیشتەجێ بوو. سامانەکانی خۆی لەبەسرە و بەغداد بردە ئەو شارە و لەناو سوپا و هـاوەڵانی دابەشـی کـرد. دواتـر کـوڕی بـەقیەی گـرت چوونکە کـوڕی بەقیـە ئـەوی پـشتگوێ خـستبوو و کارەکـانی بـێ راوێـژ کـردن بەبـەختیار ئـەنجام دەدا و باجی بـۆ خـۆی کـۆدەکردەوە و هیـچی بەبـەختیار نـەدەدا. بـەختیار بـەگرتنی کوڕی بەقیـە دەیویـست خـۆی لـەعێزەد ئەلدەولـە نزیـک بکاتـەوە چوونکە هۆکاری تێکچوونی پەیوەندییەکانی بەختیار و کوڕی عێزەد ئەلدەوله کوڕی بەقیە بوو.

کاتێـک بـەختیار کـوڕی بـەقیەی گـرت، سامانەکەیـشی زەوت کـرد و سـەبارەت بەئاشـتی نامـەی بـۆ عێـزەد ئەلدەولـە نووسـی. پەیکـەکان لـەنێوان ئـەو دووانـە هاموشۆیان دەکرد. هاوەڵانی بەختیار بۆ ئاشتی لەگەڵ عێزەد ئەلدەوله هاودەنگ و هاوهەڵوێست نەبوون، دەستەیەک رازی و دەستەیەک دژایەتییان دەکرد و رێگەیان نـەدەدا پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ عێـزەد ئەلدەولـە ئاسـایی بکاتـەوە. لـەم کاتـەدا عەبدرەزاق و بەدر، کوڕەکانی حەسنەوییە، لەگەڵ هـەزار سوار بۆ هاوکاری کردنی بەختیار هاتن و کاتێك هاتنە لای بەختیار وایان نیشاندا مەبەستی مانەوە لەواسێت و جـەنگ دژی عێـزەد ئەلدەولـەیان لەسـەردایە. عێـزەد ئەلدەولـە ئاگـادار بوویـەوە بـەختیار رێـزی لەپەیمانەکـە نـەگرتووە بـەڵام لەرێگـە چاوپۆشـی لـەم کـارە کـرد و

ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر. دوو کوڕەکەی حەسنەوییە بۆ لای باوکیان گەڕانەوە و بەختیار تا کۆتایی ئەم ساڵە لەبەغداد مایەوە. عیزەد ئەلدەولە بەرەو واسط بەڕێکەوت و لەوێوە ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر و ئاشتی لەنێوان ڕەبیعە و موزێر سەقامگیر کرد. ئەم دوو هۆزە بۆ ماوەی نزیکەی سەد وبیست ساڵیان بەجەنگ و دژایەتی کردنی یەکتر بەسەر برد.

یەکێك لەبابەتە سەرنج ڕاکێشەکان لەم ڕووداوە بۆ بەختیار ئەمەیە: ئەو کۆیلەیەکی تورکی بوو کەخۆشی دەویست. ئەم کۆیلەیە لەناو ئەسیرەکاندا بوو، بەختیار هەواڵی ئەوی نەدەزانی و لەبەر ئەمە خەمبار بوو تا ئەو ڕادەی لەخۆشییەکانی دەورانی فەرمانڕەوایەتی خۆی چاوپۆشی کرد و لەبەردەم هەمووان وتی: خەمباری من بۆ چارەنووسی کۆیلەکەم زیاترە لەخەمباریم بۆ ئەو کاتەی فەرمانڕەوایەتیم لەدەست بڕوات. دواتر ئاگادار بوویە کۆیلەکەی ئەسیر کراوە. پەیکی بۆ لای عیزەد ئەلدەولە نارد و ڕایگەیاند هەرچی بخوازێت، پێی دەدات بەو مەرجەی کۆیلەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە. عیزەد ئەلدەولە کۆیلەکەی بۆ گەڕاندەوە و ئەم پێشهاتە بوو بەوێردی سەرزمانان و لای فەرمانڕەواکانی و کەسانی دیکە ڕیسوایی زیاتری بەختیاری لێکەوتەوە.

## مەرگی مەنسور کوڕی نوح و فەرمانڕەوایەتی نوحی کوڕی

لەم ساڵەدا ئەمیر مەنسور کوڕی نوح، فەرمانڕەوای خوراسان و ماوەرائەلنەهر، لەنیوەی شەوال/ نۆی جون، مرد. ئەو لەبوخارا مرد و بۆ ماوەی پانزە ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و دوای ئەو کوڕەکەی باوکی قاسم نوح جێگەی باوکی گرتەوە کە لەم کاتەدا ساڵەکانی تەمەنی لەسیانزە تێپەڕی نەدەکرد. نازناوی مەنسوریان پێبەخشی.

## مەرگی قازی مونزەری بەلوتی

لەزیقەعدە/ جونی ئەم ساڵە باوکی حاکم قازی مونزەر کوڕی سەعیدی بەلوتی قازی قازییەکانی ئاندۆلۆس کۆچی دوایی کرد. ئەو پێشەوایەکی فەقیە، وتاردەر، شاعیر و زمان پاراو و وباوەڕدارێکی راستینە بوو. رۆژێك پۆشتە لای عەبدولرەحمانی ناسر فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس. لەم کاتەدا عەبدولرەحمان ، ئەلزەهرا و کۆشکەکانی دیکەی بەرز کردبوویەوە و لەگومەزێکی زێڕین و بێ وێنە دانیشتبوو. ژمارەیەك لەگەورەکان دەوریان گرتبوو. عەبدولرەحمانی ناسر وتی: ئایا بیستووتانە کەسێك هاوشێوەی ئەم کۆشکەکەی دروست کردبێت؟ وتیان: نە بینیومانە و نەبیستوومانە و بۆ وەسف کردنی کۆشکەکە زێدەڕۆییان کرد (مەراییان کرد) بەڵام قازی سەری داخستبوو. عەبدولرەحمان داوای لێکرد شتێك بڵێت. قازی فرمێسك لەچاوی هاتەخوار بەشێوەیەك ڕیشی تەڕ بوو و وتی: سوێند بەخوا گومانم نەدەکرد شەیتان بەم شێوەیە بەسەر تۆدا زاڵ ببێت و ئەو وەك رێبەر و سەرۆکی خۆت هەڵبژێریت، هەرچەند خواوەند هەرچیت ویستووە، بەتۆی بەخشیوە و لەپێشی پێداویت تا ئەوەی هەنووکە بۆ پێگەی خوانەناسەکان دابەزیوت. عەبدولرەحمان پێی وت: بزانە چی دەڵێیت و چۆن خواوەند منی بۆ پێگەی خوانەناسەکان دابەزاندووە؟ قازی وتی: خواوەندی گەورە دەفەرمێت: (( و ئەگەر نەئەوە دەبوو خەڵکان هەموو دەبوونە یەك ئۆمەت، سەقفی ماڵی ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخواوەندی رەحمان نییە، دەمانکردە سیم و پەیژەمان بۆ دادەنا تا لێی سەرکەوتن، بۆ ماڵەکانیان دەرگای زیومان دادەنا و ئەو تەختانەی پاڵیان پێوەدەدا بە زیو دەمانرازاندەوە))، (( لەکاتێکدا ئاخیرت (ئەو دنیا) لای پەروەردگاری تۆ بۆ خۆپارێزانە)).[٢]

عەبدولرەحمان بێدەنگ و دەستی کرد بەگریان، دواتر وتی: خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە و نمونەی تۆ لەناو موسوڵمانان زیاد بکات.

---

[٢]- زخرف/ ٣٣تا ٣٤، و لو لا ان يكون الناس امة واحدة لجعلنا لمن يكفر بالرحمنلبيوتهم سقفاً من فضة و معارج عليها يظهرون، و لبيوتهم ابوابا و سرراً عليها يتكئون، و زخرفا)) ((و الاخرة عند ربك للمتقين))

گێڕانەوەکانی تایبەت بەم قازییە فراوانە و هەنووکە یەکیان دەگێڕینەوە: وشکەسالی بەرۆکی خەڵکانی گرت و مەبەستی ئەوەیان کرد بۆ نوێژە بارانە بڕۆنەدەر. عەبدولرەحمان پەیکی بۆ لای قازی نارد و فەرمانی پێدا لەگەڵ خەڵکان بڕوات. قازی بەپەیکی وت: خۆزگە دەمزانی ئەمیر ئەمڕۆ چ بارودۆخێکی هەیە؟ پەیك وتی: هەرگیز بەم شێوەیە وەك کەسێکی لەخۆبوردوو نەمبینیوە، جلێکی زبری لەبەر کردووە و لەسەر خۆڵ ڕاکشاوە و خۆڵی بەسەر و ڕیشی خۆیدا کردووە و دەگریت و دانی بەگوناحەکانیدا ناوە و دەڵێت: ئەمە قژی ناوچاوی منە لەدەستی تۆدایە، ئایا دەخوازیت لەبەر گوناحەکانی من سزای ئەم خەڵکە بدەیت؟

قازی وتی: عابایەك لەگەڵ خۆت ببە (تا تەڕ نەبیت) چوونکە خواوەند مۆڵەتی تێراو بوونی پێداوین چوونکە هەرکات سوڵتان ببێتە کەسێکی لەخۆبوردوو، سوڵتانی ئاسمان بەزەیی بەخەڵکدا دێتەوە. قازی ڕۆشتەدەر و لەگەڵ خەڵکان نوێژە بارانەیان خوێند و کاتێك ڕۆشتە سەر مینبەر، بینی خەڵکان چاویان تێبڕیوە، وتی: ((سلاوتان لێ بێت، خواوەند ڕەحمەتی خۆی نووسیوە، هەرکەس لەئێوە بەهۆی نەزانییەوە خراپە بکات و دواتر تۆبە بکات، و چاکەکار بێت.....))[٢]

قازی چەند جارێك ئەم ئایانەی خوێندەوە، دواتر خەڵکان گریان و دەنگی تۆبەیان بەرز کردەوە و کاتێك وتارەکەی کۆتایی پێهات، خەڵکان تێراو بوون.

## گرتنی باکوی فەتح کوڕی عەمید

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە، باوکی فەتح کوڕی عەمید، وەزیرەکەی باوکی گرت و چاوێکی ئەوی دەرهێنا و لووتی بڕی.

هۆکاری ئەم کردەوەی ئەوە بوو کاتێك باوکی فەتح لەبەغداد لەگەڵ عێزەد ئەلدەولە مابوویەوە – ئاماژەمان پێدا– و عێزەد ئەلدەولە بەرەو فارس بەرێکەوت، فەرمانی بەباوکی فەتحدا بەخێرایی لەبەغدادەوە بەرەو ڕەی بڕوات بەلام باوکی فەتح ڕازی نەبوو و لەبەغداد مایەوە چوونکە حەزی بەمانەوە لەو شارە دەکرد و

---

[٢]- انعام/ ٥١/ سلام علیکم، کتب ربکم علی نفسه الرحمة انه من عمل منکم سوۆا بجهالة ثم تاب من بعده و اصلح

لەگەڵ بەختیار سەرقاڵی رابواردن و مەی خواردنەوە بوو. لەبەغداد چەندین منداڵ و زەوی هەڵبژارد تا دوای مەرگی رۆکن ئەلدەولە بۆ ئەو شوێنانە بگەڕێتەوە و دواتر سەبارەت بەچەندین پرس نامەی بۆ بەختیار نووسی کەعێزەد ئەلدەولە پەسەندی نەدەکرد.

باوکی فەتح نوێنەرێکی لای بەختیار دانابوو کەنامەکانی دەگەیاندە دەستی بەختیار. ئەم نوێنەرە هەواڵەکانی سات بەساتی بۆ عێزەد ئەلدەولە دەنووسی. کاتێك عێزەد ئەلدەولە دوای باوکی هاتە سەرکار، نامەی بۆ فەخر ئەلدەولەی برای نووسی تا باوکی فەتح و کەسان و هاوەڵانی ئەو لەڕەی بگرێت. فەخر ئەلدەولە ئەو کارەی کرد و بنەماڵەی کوڕی عەمید، بەهەمان شێوە کەباوکی، باوکی فەزڵ چاوەڕوان بوو، بەدەستی فەخر ئەلدەولە لەیەك هەڵوەشایەوە.

باوکی فەتح ئەو شەوەی بۆ بەیانییەکەی قۆڵبەست کرا، بەخۆشی بردییە سەر و هاونشین و گۆرانیبیژەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و کەرەستەی زێڕین و بلورینیان هێنایە پێش، بۆنی خۆشی بڵاو کردەوە کەلای کەس دەستنەدەکەوت. ئەوان خواردیانەوە. باوکی فەتح ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان و گۆرانیبێژەکان دەستبەجێ خوێندیان:

دعوت المنى و دعوت العلى          فلما اجابا دعوت القدح
و قلت لايام شرخ الشباب          الى فهذا اوان الفرح
اذا بلغ المرء آمالة          فليس له بعدها مقترح

واتاکەی: داوای هاتنەدی ئارەزووەکان و پێگەی بەرزم کرد و کاتێك وەڵامیان دامەوە، داوای بادەم کرد. لەرۆژگاری گەنجیدا وتم کەهەنووکە کاتی شادی و رابواردنە. هەرکات پیاو بەئارەزووەکانی خۆی بگات، چیتر هیچ شتێك تازە و دڵگیر نابێت.

کاتێك ئەم هۆنراوە بەگۆرانی خوێندرا، حەزی پێکرد و بەردەوام خواردییەوە تا مەست بوو، هەستا وبە کۆیلەکانی وت: ئەم کۆڕ و دانیشتنەی ئێمە بەهەمان شێوە بەجێبێڵن تا بەرەبەیان دێت و بەهاونشینەکانی وت: شەو بکەنە رۆژ و بەرەبەیانی بەیانی بێ دواکەوتن بگەڕێنەوە. هاونشینەکان ڕۆشتن. ئەو بۆ ماڵەکەی خۆی

گەڕایەوە. بۆ بەیانی مۆئەیید ئەلدەولە بانگی کرد و قۆڵبەستی کرد وبردییە ماڵەکەی خۆی و هەموو شتەکانی ماڵەکەی تالاّن کرد. هەروەها هەموو دەفر و قاپەکانی ئەو دانیشتنەی دزی.

## مردنی حاکم و فەرمانڕەوایەتی هوشامی کوڕی

لەم ساڵەدا حاکم کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان موستەنسیر باللە ئومەوی، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس مرد. ئەو پانزە ساڵ و پێنج مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد و ساڵەکانی ژیانی لەشەست و سێ ساڵ و حەوت مانگ کۆتایی پێهات. چاوەکانی سوور و لووتی هەڵۆیی بوو، دەنگی بەرز و ئەندامەکانی جەستەی ئەستووڕ و بەرزەبالاّ بوو. بنەماڵەی بەیتی خۆش دەویست (اهل بیت). پیاوێکی فرەزان و لەمەزهەبە جۆراوجۆرەکان شارەزا بوو، ڕەچەڵەك ناس، دیرۆك ناس بوو. کتێب و زاناکانی کۆ دەکردەوە و ڕێزی لەفرەزانەکان دەگرت و چاکەی لەگەڵ دەکردن. ئەوانی لەشارە دوورەکانەوە بۆ بارەگاکەی دەهێنا تا کەڵك لەزانستەکەیان وەربگرێت.

کاتێك حاکم کوڕی عەبدولرەحمان مرد، وەك باوکی وەسیەتی کردبوو، هوشامی کوڕی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت لەکاتێکدا ساڵەکانی تەمەنی لەدە تێپەڕی نەدەکرد. نازناوی مۆئەیید باللە یان پێبەخشی. سەرزەمینی ئیسلامی لەدەورانی ئەو گرفتاری ناسازگاری بوو. خۆی گرفتار و زیندانی کرا بەلاّم دووبارە بۆ سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی گەڕایەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك مۆئەییەد هاتەسەر کار، مەنسور باوکی عامر محەممەد کوڕی باوکی عامری موعافری و دوو کوڕەکەی، موزەفەر و ناسر وەك پەردەداری ئەو دەستنیشان کران. کاتێك باوکی عامر وەك پەردەداری ئەو دەستنیشان کرا، ڕێگەی سەردانی بەخەڵکان نەدەدا و چیتر کەس ئەوی نەدەبینی و پەیوەندی خەڵکان لەگەڵ ئەو پچڕا. باوکی عامر بەشێوەیەکی خۆویستانە کاروباری حکومەتی بەڕێوە دەبرد. ئەو دادپەروەری لەناو خەڵکان بلاّو کردەوە و دنیا ئامێزی بۆ ئاوەلاّ کرد. دواتر رووی کردە جەنگ و دەستی بەسەر چەندین

بەش لەسەرزەمینەکانی دوژمندا گرت و بەم شێوەیە ئاندۆلۆس لەکۆیلە و تالأنییەکان لێوانلێو بوو. ئەو زۆرینەی سوپاکەی لەناودارترین جەنگاوەران وەك وازحی فەتی و کەسانی دیکەی کۆکردەوە کە بەعامرییەکان ناسرا بوون.

خواوەند، بۆ ماوەی بیست و شەش ساڵ درێژەی بەم بارودۆخەیدا. ئەو لەم دەورانەدا پەنجا و دوو جەنگی هاوینە و زستانەی ئەنجامدا و سەرئەنجام لەساڵی ٣٩٢/ ١٠٠١ زایینی مرد. ئەو پیاوێکی دوورئەندێش، خاوەن بڕیار، دادپەروەر، چاکەکار و سیاسەت باز بوو.

یەکێك لەوشیارییەکانی باوکی عامر ئەمە بوو: بۆ جەنگ ڕۆشتە سەرزەمینی فەرەنگەکان و لەدۆڵێکی تەنگ و تەسك کەئەوی دەگەیاندە سەرزەمینی دوژمن، گوزەری کرد بەلأم لەگەڕانەوەدا بینی، ڕێگەیان بەستووە و لەبەرابەر موسوڵمانان پارێزگاری لەو ڕێگەیە دەکەن. باوکی عامر وای نیشاندا مەبەستی مانەوە لەو سەرزەمینەی هەیە و لەگەڵ سوپاکەی بەئاوەدان کردنەوەی ماڵەکان و کشتوکاڵ سەرقاڵ بوون، چیلکە و ئالیك و هەموو پێداویستییەکانی خۆیان کۆکردەوە. کاتێك فەرەنگییەکان بینیان مەبەستی مانەوەی هەیە، ڕێگەی سازگارییان گرتەبەر و نامەیان بۆنووسی ئەگەر ئەوەی تالأنت کردووە، بەجێی بێڵێت دەتوانیت لەڕێگەکە گوزەر بکەیت. باوکی عامر وەلأمی دایەوە: مەبەستی مانەوەم هەیە. تالأنییەکانیان بەخۆیدا بەلأم وەلأمی نەدانەوە. پارە و چوارپێیان خستە بەردەست بۆ ئەوەی تالأنییەکانی لەو سەرزەمینە بگوازێتەوە. لەم کاتەدا ڕازی بوو و فەرەنگییەکان ڕێگەیان بۆ کردەوە و باوکی عامر ڕێگەی سەرزەمینی خۆی گرتەبەر. ڕەچەڵەکی باوکی عامر لەدوورگەی خەزرا بوو، لەگەنجیدا هاتە قەرتەبە (کوردوبا) تا ئەدەب و زانست فێر ببێت و حەدیسەکان ببیستێت. ئەو لەم زانستانەدا شارەزایی بەدەست هێنا و لەناو هەموان ناسرا و دواتر خزمەت کردنی سوبح، دایکی مۆئەییەدی دەست پێکرد و لای ئەو پێگەی بەرز بوویەوە. کاتێك حاکم موستەنسیر مرد، مۆئەییەد منداڵ بوو و لەبەر ئەمە ترسی ئەوەی لێدەکرا وڵات گیرۆدەی ناسازگاری و چەند بەرەکی بێت. باوکی عامر بەڵێنی بەسوبحدا ئارامی وڵات بپارێزێت و ترسی لەسەر نەهێڵێت. ئەو پیاوێکی بەهێز و ڕۆژگاریش

هاوکاری کرد. فەرمانڕەواکان بەپارە هاوکارییان کرد و ئەو ڕێزی لەسوپا وسوپاییەکان گرت و بەم شێوەیە کاروبارەکان بەباشترین شێوە بەڕێوەبرا.

دایکی باوکی عامر لەتەمیم و باوکی لەموعافر، لقێك لەهۆزی حومەیرە. کاتێك باوکی عامر مرد، عەبدولمەلیکی کوڕی بەنازناوی موزەفەر جێگەی باوکی گرتەوە و ڕێچکەی باوکی گرتەبەر بەلاّم دوای حەوت ساڵ لەفەرمانڕەوایەتی لەساڵی ١٠٠٨/٣٩٩ مرد.

چۆنیەتی مەرگی عەبدولمەلیك بەمشێوە بوو: براکەی سێوێکی بەکێردێکی ژەهراوی دوو لەت کرد و ئەو نیوەی ژەهری پێوە نەبوو لەبەر چاوی براکەی خواردی تا دڵنیا بێت و نیوە ژەهراوییەکەی دەرخواردی ئەودا کەبووە هۆی مردنی.

کاتێك موزەفەر مرد، عەبدولرەحمان بەنازناوی ناسر جێگەی ئەوی گرتەوە و شێوازێکی جیاواز لەباوك و براکەی گرتەبەر و سەرقاڵی رابواردن و خۆشگوزەرانی بوو. دواتر بەشێوەیەکی نهێنی هەڕەشەیان لەمۆئەییەد کرد بۆ ئەوەی وەك جێگری خۆی دەستنیشانی بکات. مۆئەییەد ئەو کارەی کرد. خەڵکان و منالەکانی ئومەییە ڕقی ئەویان لەدڵ گرت و ئاگری توڕەییان بڵێسەی سەند و بەرادەیەك بۆسەیان بۆ کوشتنی ئەو نایەوە تا سەرئەنجام لەناویان برد.

عەبدولرەحمان لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی خۆی، جەنگی زستانەی ئەنجامدا و ڕۆشتە سەرزەمینی جەلیقییە (گالیسیا) بەلاّم فەرمانڕەوای ئەو شارە بۆ جەنگی ئەو نەهاتە گۆڕەپان و لەچیا بەرزەکان سەنگەری گرت. فراوانی رووبار و بارینی بەفرێکی زۆر ڕێگەی بە عەبدولرەحمان نەدا شوێنپێی هەڵگرێت. عەبدولرەحمان ڕۆشتە هەر شوێنێك لەناوی برد و لەگەڵ تالاّنییە فراوانەکان سەرزەمینی جەلیقییەی بەجێهێشت. لەنیوەی ڕێگە لەدەرکەوتنی محەممەد کوڕی هوشام کوڕی عەبدجەبار کوڕی ناسر لدین الله لەقورتەبە و زاڵبوونی ئەو لەو شارە و ئەسیر کرانی مۆئەییەد ئاگادار بوویەوە. سوپاکەی عەبدولرەحمان بلاّوەیان لێکرد و جگە لەکەسە تایبەت و نزیکەکانی کەسی لەگەڵ نەما. عەبدولرەحمان بەتاوانی ئەم ڕووداوە هێرشی کردە سەر قورتەبە. سوپاکەی محەممەد کوڕی هوشام ڕووبەڕووی

بوونەوە و کوشتیان و سەری ئەویان بەناو قورتەبەدا گەڕاند. مەرگی ئەو لەساڵی ٣٩٩/ ١٠٠٨ زایینی ڕوویدا.

## دەرکەوتنی محەممەد کوڕی هوشام لەقورتەبە

لەساڵی ١٠٠٨/٣٩٩ زایینی محەممەد کوڕی هوشام کوڕی عەبدجەبار کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ناسرلدین الله ئومەوی، لەگەڵ دوانزە پیاو لەقورتەبە دەرکەوت و خەڵکان دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. ئەو لەکۆتایی جومادی الاخرە/ بیست و سێی فەوریەی ٩٧٧ زایینی شۆڕشەکەی دەست پێکرد و نازناوی مەهدی بالله ی پێبڕا. ئەو قورتەبەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و مۆئەییدی گرت و لەکۆشکەکەی زیندانی کرد و دواتر ئەوی هێنایەدەر و شاردییەوە و وای نیشاندا کەمردووە. پیاوێکی مەسیحی مردبوو کەهاوشێوەی مۆئەییەد بوو. ئەو مردووی ئەو مەسیحییەی لەمانگی شەعبان/ مارس نیشانی خەڵکاندا و ئەوی بەمۆئەییەد ناساند وهەمووان باوەڕیان بەمەرگی ئەو کرد. نوێژیان لەسەر خوێند و لەگۆڕستانی موسوڵمانان بەخاکیان سپارد دواتر –ئاماژەی پێدەدرێت– ڕاستی ئەم مردووەی ئاشکرا و پەردەی لەسەر درۆکەی خۆی هەڵگرت. مۆئەییەد تا کاتی قۆڵبەست کرانی سی و سێ ساڵ و چوار مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد. خەڵك لەبەر ستەمکاری و کارە قێزەونەکانی عەبدجەبار لێی نیگەران و بێزار بوون. یەکێك لەکارە قێزەونەکانی ئەوەیە کە لەکۆشك مەی دەخواردەوە و لەبەر ئەمە بەشەراب هاوێژ ناویان برد. یەکێکی دیکە لەکارەکانی، کردارەکەی لەگەڵ مۆئەییەد و درۆکەی بوو. ئەو پیاوێکی درۆزن، دەمدەمی و دژی بەربەرەکان بوو.

## شۆڕشی هوشام کوڕی سلێمان دژی محەممەد کوڕی هوشام

کاتێك خەڵکانی ئاندۆلۆس لەعەبدجەبار بێزار بوون و ڕقی ئەویان لەدڵ گرت، لەدەوری هوشام کوڕی سلێمان کوڕی عەبدولرەحمان ناسر لدین الله کۆبوونەوە و ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. ئەو نازناوی

ڕەشیدی پێبڕا. ئەم پێشهاتە لەبیست و شەشی شەوالی ٣٩٩/ شەشی جولای ١٠٠٧ زایینی ڕوویدا. ئەوان لەدەرەوەی قەرتوبە کۆبوونەوە و گەمارۆیان خستە سەر کوڕی عەبدجەبار. پەیکەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان کرد و لەسەر ئەوەی هوشام ئەمان بەخۆی و بنەماڵەکەی بدا، رازی بوو دەست لەکار بکێشێتەوە.

دواتر عەبدجەبار سوپاکەی کۆکردەوە و بۆ جەنگی ئەوان قۆڵی هەڵکرد. هوشام کوڕی سلێمان هەڵات و سەرئەنجام ئەسیر کرا و کوڕی عەبدجەبار ئەوی کوشت و خوێنی ژمارەیەك لەسەرکردەکانیشی ڕشت. بەم شێوەیە جارێکی دیکە بارودۆخ بۆ کوڕی عەبدجەبار سەقامگیر بوو. کوڕی عەبدجەبار، مامی هوشام بوو.

## شۆڕشی سلێمان دژی هوشام

کاتێك کوڕی عەبدجەبار، هوشام کوڕی سلێمان کوڕی ناسری کوشت و هاوەڵانی هەڵاتن، سلێمان کوڕی حاکم کوڕی سلێمان کوڕی ناسر، برازای هوشامی کوژراو، هەڵات. شوێنکەوتەکانی مامی کەزۆربەیان بەربەر بوون، دوو ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە بەیعەتیان لەگەڵ کرد و نازناوی موستعین باللە یان پێبەخشی بەڵام دواتر نازناوەکەی بۆ ظاهر(زاهیر) باللە گۆڕا. ئەوان ڕۆشتنە لای مەسیحییەکان و پەیمانی ئاشتییان بەست و داوای هاوکارییان کرد. مەسیحییەکان هاوکارییان کردن و هەموان ڕێگەی قەرتوبەیان گرتەبەر و لەقەنتیج ڕووبەڕووی سوپاکەی عەبدجەبار بوونەوە. ئەم جەنگە، جەنگێکی ناوداره کەژمارەیەکی زۆری تێدا کوژرا. کوڕی عەبدجەبار هەڵات و لەکۆشکی قەرتوبە خۆی شاردەوە. سلێمان ڕۆشتە ناو شارەکە و لەکۆشك، گەمارۆی خستە سەر کوڕی عەبدجەبار.

کاتێك کوڕی عەبدجەبار ئەم بارودۆخەی بینی، مۆئەییەدی هێنایەدەر چوونکە گومانی دەکرد مۆئەییەد هەردووکیان (خۆی و سلێمان) لەسەر کار لادەبات و خەلافەت بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە بەڵام کەسانی دیکە چوونکە مۆئەییەدیان بەمردوو دەزانی، هاوکارییان نەکرد. کاتێك کوڕی عەبدجەبار ناتەوان بوو، خۆی شاردەوە. سلێمان ڕۆشتە ناو کۆشك و لەشەوالی ٤٠٠/ مەی ١٠١٠ زایینی

خەڵکان دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. ئەو چەند رۆژێک لەقەرتوبە مایەوە. ژمارەکەی کوژراوەکانی قەنتیج سی و پێنج هەزار کەس بوو. دواتر بەربەر و رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر قەرتوبە و سامانەکانیان تالآن و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر کرد.

## چۆنیەتی گەڕانەوەی کوڕی عەبدجەبار و کوژرانی ئەو، گەڕانەوەی مۆئەییەد

کاتێک کوڕی عەبدجەبار خۆی شاردەوە، بەشێوەیەکی نهێنی بەرەو تەلیتەڵە (تۆلێدۆ) بەرێکەوت. وازحی فەتی عامری و هاوەڵانی لەدەوری کۆبوونەوە و مەسیحییەکانی بۆ ئەو کۆکردەوە و هەموانی بەرەو قەرتوبە برد. سلێمان بۆ جەنگی ئەو هاتەدەر و لەنزیک عەقەبەی ئەلبەقەر رووبەرووی یەکبوونەوە و شەڕێکی مەترسیدار دەستی پێکرد. سلێمان و سوپاکەی لەنیوەی شەوالی ساڵی ٤٠٠/ دووی جونی ١٠١٠ زایینی شکستیان خوارد. سلێمان بۆ شاتەبە هەلآت و کوڕی عەبدجەبار رۆشتە ناو قەرتوبە و دووبارە بەیعەتی بۆ خۆی وەرگرتەوە. وازحی کردە پەردەداری خۆی و دەستی ئەو بۆکاروبارەکان ئاوەڵا کرد.

دەستەیەک لەگەنجە عامرییەکان وەک عەنبەر، خەیرون و ژمارەیەکی دیکە کە لەناو سوپاکەی سلێماندا بوون، پەیکیان بۆ لای کوڕی عەبدجەبار نارد و داوایان لێکرد بیانبەخشێت و لەناو کەس و سوپاکەی خۆی جێگەیان بکاتەوە و ملکەچ بوونی خۆیان نیشاندا. کوڕی عەبدجەبار رازی بوو. ئەم دەستەیە بۆ فریودانی ئەم داوایان کرد تا بتوانن بیکوژن. کاتێک ئەم دەستەیە هاتنە قەرتوبە، رێزیان لەوازح کرد. وازح بەپێشنیاری کوشتنی عەبدجەبار رازی بوو. لەنۆی زیحەججەی ساڵی ٤٠٠/ بیست و پێنجی جولای ١٠١٠ زایینی، هەموان لەکۆشکی عەبدجەبار کۆبوونەوە و کۆشکیان خستە ژێر فەرمانی خۆیان. کوڕی عەبدجەباریان گرت و مۆئەییەدیان هێنایەدەر و لەسەر تەختی خەلافەت دایاننیشاند و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. کوڕی عەبدجەباریان بردە لای و مۆئەییەد گوناح و

تاوانەکانی ئەوی بژارد و فەرمانی کوشتنیدا. ئەویان کوشت و سەریان بەناو قەرتوبەدا سووڕاند.، دایکی ئەو دایکی منالْ و سی سالْ ژیا.

شیاو بوو دواتر ئاماژە بەم ڕووداوانە بدەین بەڵام لەبەر پەیوەست بوونیان بەیەکتر لێرەدا باسمان کرد چوونکە هەرکامیان کۆتاییەکەی ئەوتۆی نییە بتوانین بەشێوەیەکی سەربەخۆی ئاماژەی پێبدەین.

## چۆنیەتی گەڕانەوەی باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە بۆ فەرمانڕەوایەتی حەلەب

لەم ساڵەدا باوکی ئەلمەعالی شەریف کوڕی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدان دووبارە فەرمانڕەوایەتی حەلەبی گرتەدەست. چۆنیەتییەکەی –وەك لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٩٦٧/٣٥٧ زایینی ئاماژەی پێدرا– بەم شێوە بوو: کاتێك قەرغویە لەحەلەب سەرکەوتنی بەدەست هێنا، سەروەری خۆی، باوکی ئەلمەعالی لەو شارە دەرپەڕاند. باوکی ئەلمەعالی ڕۆشتە لای دایکی لەمەیافارقین و لەوێوە بەرەو حەمات بەرێکەوت کە لەناو سنووری دەسەلاتی خۆیدا بوو. لەوێ ئوردووی لێدا. ڕۆمییەکان، حیمس و ئەو کەنارەیان وێران کردبوو – پێشتر ئاماژەمان پێدا– . یارقوتاش، موالی باوکی (سەیف ئەلدەولە) کە لەقەلای بەرزویە بوو، ڕۆشتە لای و خزمەتی کرد، شاری حیمسی ئاوەدان کردەوە و دانیشتووانەی شارەکە دووبارە فراوان بوون.

قەرغویە یەکێك لەموالییەکانی وەك جێگری خۆی لەحەلەب دانابوو بەناوی بەکجور. بەکجور پێگەی بەرز بوویەوە و سەروەری خۆی، قەرغویەی، قۆلبەست کرد و لەقەلای حەلەب زیندانی کرد. بەکجور فەرمانڕەوایەتی شارەکەی لەدەستدا بوو. شوێنەکەوتەکانی قەرغویە لەحەلەب نامەیان بۆ باوکی ئەلمەعالی نووسی و داوایان لێکرد بەرەو حەلەب بەرێکەوێت و بیخاتە ژێر فەرمانی خۆی. باوکی ئەلمەعالی بەرەو حەلەب بەرێکەوت وبۆ ماوەی چوار مانگ گەمارۆیدا و سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

قەڵاکە هێشتا لەدەستی بەکجوردا بوو. پەیك لەنێوان باوکی ئەلمەعالی و بەکجور هاتوچۆی دەکرد. سەرئەنجام بەکجور رازی بوو بەو مەرجەی باوکی ئەلمەعالی ئەمان بەخۆی و بنەماڵە و سامانەکەی بدات و فەرمانڕەوایەتی حیمسی پێبسپێرێت، خۆی بەدەستەوە بدات و خوازیار بوو دەستەیەك لەگەورەکانی منداڵەکانی کەلاب بۆ ئەم ئەمان و پەیمانە شایەت بن. باوکی ئەلمەعالی رازی بوو و لەکاتی بەخشینی ئەمان ئەوانی کۆکردەوە و بەکجور قەڵای حەلەبی بەباوکی ئەلمەعالی سپارد و رێگەی حیمسی گرتەبەر تا بەنوێنەرایەتی باوکی ئەلمەعالی فەرمانڕەوایەتی ئەو شارە بکات. ئەو بۆ ئاوەدان کردنەوە و پارێزگاری کردن لەم شارە هەوڵەکانی خستەگەڕ بەم شێوەیە شارەکە ئاوەدان و دانیشتووانەکەی فراوان و لەساڵی ٩٨٦/٣٧٦ زایینی –ئاماژەی پێدەدەین– بەرەو دیمەشق بەرێکەوت.

## سەرەتای فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی سەبوکتەکین

لەم ساڵەدا سەبوکتەکین، فەرمانڕەوایەتی شاری غەزنە و کەنارەکانی گرتەدەست. سەرەتای دەرکەوتنی بەم شێوە بوو: ئەو یەکێك لەکۆیلەکانی باوکی ئیسحاق کوڕی ئەلبتەکین، فەرمانداری سامانی سوپای غەزنە بوو. لای ئەلبتەکین پێگەیەکی بەرز و بەرێوەبردنی کاروبارەکان لەئەستۆی ئەودا بوو. سەبوکتەکین لەرۆژگاری ئەمیر مەنسور کوڕی نوح لەگەڵ باوکی ئیسحاق ڕۆشتە بوخارا و بەرێوبەرانی ئەو سنوورە، ئەویان بەکەسێکی بیرمەند، داوێن پاك و خاوەن بڕیار و بەهێز بینی. سەبوکتەکین لەگەڵ باوکی ئیسحاق بۆ غەزنە گەڕایەوە. ماوەیەك دواتر باوکی ئیسحاق مرد و لەبنەماڵە و کەسە نزیکەکانی خۆی کەسێکی کەشیاوی پێشەوایی بێت، بۆ جێگرتنەوەی خۆی دیارینەکرد. سوپاییەکان کۆبوونەوە تا سەبارەت بەهەڵبژاردنی کەسێك راوێژ بکەن تا جڵەوی کاروبارەکان بگرێتە دەست. ئەوان دوای ناسازگاری بۆ فەرمانڕەوایەتی سەبوکتەکین هاوهەڵوێست بوون چوونکە ئەویان بەکەسێکی بیرمەند، باوەڕدار و چاکەکاری دەزانی و لەبەر ئەمە پێشیان خست و جڵەوی کاروباری خۆیان بەو سپارد و

سوێندی وەفاداریان بۆ خوارد و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا. ئەو کاروبارەکانی بەرێوە دەبرد و شێوازێکی چاکەکارانەی گرتەبەر و شێوەی ژیانی خۆی بەیەکسانی لەگەڵ کەسانی دیکە هێشتەوە (گۆڕانکاری لەچۆنیەتی ژیانی دروست نەکرد). لەزەوییەکانی خۆی بەرادەیەك پاشەکەوتی دەکرد کەحەفتەی دوو جار، هەمووانی بۆ سەر سفرەکەی بانگێشت دەکرد.

دواتر سوپاییەکانی کۆکردەوە و بەمەبەستی جیهاد رێگەی هیندی گرتەبەر. لەنێوان ئەو و هیندییەکان چەندین جەنگ روویدا کەمناڵی شیرەخۆرەی پیر و ناتەوان دەکرد. ئەو شارەکانی ئەوانی دەناسی و بەشێوەیەکی ناکاو هێرشی دەکردەسەر. چاوی تەماحی بڕییە هیندییەکان و هیندییەکان ترسیان ئەویان لێ نیشت. ئەو چەندین قەڵا و سەنگەری لەهیند گرت و ژمارەیەکی ئێجگاری زۆر لەسوپاییەکان و خەڵکانی هیند کوشت.

بەرێکەوت لەیەکێك لەجەنگەکان هیندییەکان هێزێکی زۆریان کۆکردەوە و رۆژانە دەستدرێژییان دەکردە سەر سوپاکەی و کاتی جەنگەکەیان درێژ کردەوە. توێشووی موسوڵمانان کۆتایی پێهات و چیتر نەیانتوانی خواردەمەنی کۆبکەنەوە و لای سەبوکتەکین سکاڵایان کرد. ئەو پێی وتن: من کەمێك گەنم و جۆم لەگەڵ خۆم هێناوە و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەناو ئێوەدا بڵاوی دەکەمەوە ئەگەری هەیە خواوەند رێگە چارەیەکمان بخاتە بەردەم. هەر سەربازێك کاسەیەکی پڕی پێدەدا و بەهەمان ئەندازەی بۆ خۆی هەڵگرت. بەم شێوەیە شەو و رۆژیان بەسەر دەبرد و لەجەنگ دژی دوژمن بەردەوام بوون تا ئەوەی خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و ژمارەیەکی زۆر لەهیندییەکانیان کوشت و ئەسیر کرد.

## فەرمانڕەوایی سەبوکتەکین لەقوسدار و بۆست

پێگەی سەبوکتەکین بەرز بوویەوە و خەڵکان بەچاکە ناویان دەهێنایە سەرزمان و ژمارەیەکی بەرچاو حەزیان بەهاوکاری کردنی ئەو دەکرد. لەم کاتەدا یەکێك لەئەمیرە ناودارەکان بەناوی تۆغان کەفەرمانڕەوایەتی بۆستی دەکرد، گەیشتە بارەگای سەبوکتەکین و داوای هێز و هاوکاری ئەوی کرد.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: فەرماندەیەك بەناوی بابی تور دژی ئەو ئالآی شۆڕشی بەرز کردبوویەوە و شاری بۆستی خستبووە ژێر فەرمانی خۆی و دوای جەنگێکی گیانبڕی، توغانی لەشارەکە دەرپەڕاندبوو. سەبوکتەکین بەمەبەستی هاوکاری کردنی ئەو ڕێگەی بۆستی گرتەبەر و باجێکی خستە سەر شانی تۆغان تا بیدات و داوای لێکرد سەرپێچی فەرمانەکانی نەکات. سەبوکتەکین سوپای رازاندەوە و لەگەڵ تۆغان گەیشتە بۆست. بابی تور ڕووبەڕووی سەبوکتەکین بوویەوە. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و سەرئەنجام بابی تور شکستی خوارد و سوپاکەی بڵاوەی لێکرد و تۆغان جارێکی دیکە فەرمانڕەوایەتی شارەکەی گرتەدەست.

کاتێك تۆغان لەبۆست جێگیر بوو، سەبوکتەکین داوای ئەو باجەی کرد کەبەڵێن بوو بیدات بەڵام تۆغان لەڕەوانە کردنی خۆی دوادەخست. سەبوکتەکین لەبەر خۆ دواخستنی ئەو بەشێوەیەکی توند گفتوگۆی لەگەڵ کرد. نەزانی تۆغان ناچاری کرد دەست بۆ شمشێر ببات و دەستی سەبوکتەکینی بریندار کرد. سەبوکتەکینیش دەستی بۆ شمشێر برد و تۆغانی بریندار کرد. سوپاییەکان ئەو دوانەیان لەیەك جیا کردەوە. دواتر شەڕ دەستی پێکرد و تۆغان شکستی خوارد و سەبوکتەکین فەرمانڕەوایەتی بۆستی گرتەدەست. دواتر هێرشی کردە سەر قوسدار چوونکە کارگوزارەکەی ئالآی شۆڕشی بەرز کردبوویەوە و گومانی دەکرد ڕێگە دژوارەکانی ئەو سەرزەمینە ڕێگەی پێشڕەوی لەسوپاکەی سەبوکتەکین دەگرێت. سەبوکتەکین هێرشی کردە سەر شارەکە و کارگوزار کاتێك ئاگادار بوویەوە کەسەبوکتەکینی لەسەر سەری خۆی بینی. ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر بەڵام سەبوکتەکین منەتی خستەسەر و پێگەکەی بۆ گەڕاندەوە و سامانێکی دیاریکرد تا ساڵانە بۆ سەبوکتەکینی ڕەوانە بکات.

## هێرشی هیندییەکان بۆ سەرزەمینە ئیسلامییەکان و دەرئەنجامی کاری ئەوان لەگەڵ سەبوکتەکین

کاتێک سەبوکتەکین کۆتایی بەکێشەکانی بۆست و قوسدار هێنا، بەمەبەستی جیهاد دووبارە رێگەی هیندی گرتەبەر و دەستی بەسەر چەندین قەڵا لەسەر بەرزایی چیا بڵندەکان گرت و سەرکەوتووانە گەڕایەوە.

کاتێک جیبال، پاشای هیند، هەواڵی ئەم هێرشە کارەساتبارانەی بیست و بینی هەر تازە کار و تازە گیرفانێک، چاوی تەماحیان بریوەتە سەرزەمینەکەی، سوپای کۆکردەوە. چەندین فیلی ئامادە کرد و خۆی گەیاندە سنوورەکانی سەبوکتەکین وەك بڵێی تۆوی شەیتان لەسەری ئەودا جوجکەی هەڵهێنابوو. سەبوکتەکین لەگەڵ سوپاکەی و هێزە خۆبەخشەکان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەسپی غاردا. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و چەندین رۆژ جەنگان. هەردوولا خۆڕاگرییان دەکرد.

لەنزیك ئوردووگای دوو سوپا، لەگەردەنەی غورەك، سەرچاوەیەکی ئاو دەبینرا کەشتە پیس و ناپاکەکانی وەرنەدەگرت و ئەگەر شتێکی ناپاکی تێدەکەوت، ئاسمان روخساری گرژ و تۆفان روویدەدا و هەورەبروسکە و باران ئاسمانی دەگرتەوە و ئەم بارودۆخە درێژەی دەکێشا تا ئەو ئاوە لەو شتە ناپاکە پاك دەبوویەوە. سەبوکتەکین فەرمانیدا شتێکی ناپاك فرێبدەنە ناو ئاوەکە و بەم شێوە بوو هەورە بروسکە دەستی پێکرد وەك بڵێی رۆژی هەستانەوەی هیندییەکان دەستی پێکردبێت چوونکە هیچ کات رۆژێکی لەو چەشنەیان نەبینیبوو. هەورە بروسکە و باران بەردەوام بوون، سەرما زیادی کرد و ژمارەیەکی زۆر مردن و پاشماوەکان رێگەیان ون کرد و لەسەختی ئەو بەڵای بەسەریاندا هاتبوو، ملکەچ بوونی خۆیان نیشاندا.

پاشای هیند پەیکی بۆ لای سەبوکتەکین نارد و خوازیاری ئاشتی بوو. پەیك لەنێوان دوو سوپا هاتوچۆی کرد. سەبوکتەکین لەگەڵ ئەوەی مەحمودی کوڕی لەگەڵ هەڵوێستەکەی رازی نەبوو، رەزامەندی نیشاندا لەبری وەرگرتنی بڕێك پارە و ئەو شارانەی جیبال پێی دەسپێرێت و وەرگرتنی پەنجا فیل، پەیمانی ئاشتی

واژۆ بکات. پەیمانەکە نووسرا و سەبوکتەکین ژمارەیەك لەکەسەکانی جیبالی وەك بارمتە لای خۆی هێشتەوە تا ئەو شارانەی بەڵێنیدا بوو، بەسەبوکتەکین بسپێرێت و کەسانێکی لەگەڵ ئەو نارد تا شارەکان وەربگرن. جیبال دەبوا پارە و فیلەکان بەخێرایی بدات. کاتێك جیبال لەو سەرزەمینە دوور کەوتەوە، ئەو موسوڵمانانەی گرت کەسەبوکتەکین بۆ وەرگرتنی شارەکان لەگەڵ ئەو ڕەوانەی کردبوون و لەبەرابەر بارمتەکانی لای سەبوکتەکین، ئەوانی بەبارمتە گرت.

کاتێك سەبوکتەکین ئەم هەواڵەی بیست، سوپای کۆکردەوە و بەرەو هیند بەرێکەوت. دەگەیشتە هەر شارێك، وێران و سەرکوت و مەبەستی هێرش کردنە سەر لەمغانی کرد. لەمغان یەکێك لەبەهێزترین قەلاّی هیندییەکان بوو. سەبوکتەکین بەزۆری شمشێر دەستی بەسەر قەلاّکەدا گرت، بتخانەکانی وێران و دروشمە ئیسلامییەکانی نووسی. لەگرتنی شارەکان و کوشتاری خەڵکان بەردەوام بوو. کاتێك بەویست و خواستەکەی خۆی گەیشت، بۆ غەزنە گەڕایەوە.

کاتێك جیبال ئەم هەواڵەی بیست، سەرگەردان بوو، سوپای کۆکردەوە و لەگەڵ سەد هەزار جەنگاوەر بەرێکەوت. سەبوکتەکین ڕووبەڕووی بوویەوە و فەرمانی بەسوپاکەیدا بەچەندین جار ڕووبەڕووی هیندییەکان ببنەوە. سوپاییەکان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد. هیندییەکان لەجەنگ دژی موسوڵمانان بێزار بوون و بەیەکجاری هێرشیان هێنا. لەم کاتەدا بارودۆخ سەخت و دژوار بوو. موسوڵمانانیش یەکدەست هێرشیان برد و سوپاییەکان ڕژانە یەك و سەرئەنجام، هیندییەکان شکستیان خوارد و شمشێریان بەسەردا باری. ژمارەیەکی نەژمێردراویان ئەسیر و بڕێکی فراوان سامان و کالاّ و چوارپێ، بەدەستی موسوڵمانان تالاّن کرا.

هیندییەکان دوای ئەم جەنگە ریسوابوون وچیتر ئالاّیەکیان نەدەبینی. بەوە رازی بوون لەکەنارە دووردەستەکانی سەرزەمینی خۆیان ڕووبەڕووی جەنگ نەبنەوە. کاتێك سەبوکتەکین دوای ئەم جەنگە بەهێز بوو، ئەفغانییەکان و خەلەج ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا.

## فەرمانڕەوایی قابوس کوڕی وەشمگیر لەجورجان

لەم ساڵەدا زوهەیر ئەلدەولە بێستون کوڕی وەشمگیر لەجورجان مرد. لەم کاتەدا براکەی، قابوس، بۆ بینینی رۆستەمی خاڵی ڕۆشتبووە چیاکان. بێستون منداڵێکی بچوکی لەخۆی لەتەبەرستان بەجێهێشتبوو کەلای باوەگەورێی دایکی ژیانی بەسەر دەبرد. باوەگەورێی دایکی چاوی تەماحی بڕییە فەرمانڕەوایی ئەو سەرزەمینە و بەرەو جورجان بەرێکەوت و لەوێ دەستەیەك لەسەرکردەکانی بینی کەخوازیاری فەرمانڕەوایەتی قابوس بوون. هەموو ئەو سەرکردانەی گرت. قابوس لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و بەرەو جورجان بەرێکەوت و کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتەوە، سوپاییەکان پێشوازییان لێکرد و هەموان بۆ فەرمانڕەوایەتی ئەو هاوهەڵوێست بوون و فەرمانڕەوایەتیان بۆ گەڕاندەوە. هاوەڵانی منداڵەکەی بێستون هەڵاتن. مامی بێستونی وەرگرتەوە و سەرپەرەستی ئەوی گرتە ئەستۆ و هاوشێوەی منداڵەکانی خۆی پەروەردەی کرد و دواتر دەستی بەسەر جورجان و تەبەرستاندا گرت.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەجومادی الاوەل/ دێسامبەری ئەم ساڵە کچی عێزئەلدەین بەختیار بۆ خەلیفە تائیع الله برا کەوەك هاوسەر هەڵبژێردبوو.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی زەکەریا، کوڕی حەیویە لەمانگی رەجەب/ فەوریە مرد.

لەسەفەر/ سێپتامبەری ئەم ساڵە باوکی حەسەن عەلی کوڕی بەوسیفی ئەلناشئی ناسراو بەخەلال، نووسەری چەندین هۆنراوە بۆ پرسەی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، مرد.

لەم ساڵەدا باوکی یەعقوب یوسف کوڕی حەسەنی جەنابی، فەرمانڕەوای هەجەر مرد. ئەو لەساڵی ٨٩٣/٢٨٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. دوای ئەو شەش لەقەرەمتییەکان کاروباری تایبەت بەقەرەمتییەکانیان بەرێوە دەبرد کە بەسادات ناو دەبران. هەموان یەك دەنگ و هاوهەڵوێست بوون.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و حەوتی کۆچی ( ٩٧٧و٩٧٨ زایینی )

## زاڵبوونی عێزەد ئەلدەولە لەعێراق

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە ڕۆشتە عێراق و پەیکی بۆ لای بەختیار نارد و پێشنیاری فەرمانبەری خۆی پێکرد و داوای لێکرد لەکوێوە دەخوازێت لەعێراق بڕوات و بەڵێنیدا سامان و کەرەستەی جەنگی پێویستی بۆ دابین بکات.

هاوەڵانی بەختیار بۆ وەڵامدانەوەی ئەم نامەیە ناسازگار بوون، بەڵام ئەو لەبەر لاوازی، بەپێشنیارەکەی عێزەد ئەلدەولە ڕازی و عێزەد ئەلدەولە خەڵاتی بۆ نارد و بەختیار خەڵاتەکەی پۆشی. عێزەد ئەلدەولە پەیکی بۆ لای بەختیار نارد و داوای کوڕی بەقیەی کرد. بەختیاریش هەردوو چاوی کوڕی بەقیەی دەرهێنا و ئەوی بۆ لای عێزەد ئەلدەولە نارد.

بەختیار بەوەی عێزەد ئەلدەولە بۆی ناردبوو، سوپایەکی ڕازاندەوە و لەبەغدادەوە بەرەو شام بەڕێکەوت. عێزەد ئەلدەولەیش بەڕێکەوت و هاتە بەغداد و بەناوی ئەو، وتاریان خوێندەوە. پێشتر بەناوی کەس وتار نەدەخوێندرایەوە. ڕۆژی سێ جار کوسیان لەبەر دەرگاکەی لێدەدا و ئەم نەریتە، پێش ئەو باوی نەبوو. فەرمانیدا کوڕی بەقیە بخەنە بەردەم پێی فیلەکان تا بمرێت. فەرمانەکەی ئەنجامدرا و فیلەکان پێشێلیان کرد. ئەم پێشهاتە لەشەوال/ مەی ئەم ساڵە لەسەر پردی بەغداد لەداریاندا. باوکی حسەینی ئەنباری لەقەسیدەیەك بۆ مەرگی ئەو دەڵێت:

| | |
|---|---|
| عول فی الحیاة و فی الممات | لحق تلك احدی المعجزات |
| کان الناس حولك حین قاموا | و فود نداك ایام الصلات |
| کانك قائم فیهم خطیبا | و کلهم قیام للصلاة |
| مددت یدیك نحوهم اقتاء | کمدهما الیهم فی االهبات |
| و لما ضاق بطن الارض عن ان | یضم علاك من بعد الممات |
| اصاروا الجو قبرك و استنابوا | عن الاکفان ثوب السافیات |

لعظمك فی النفوس تبيت ترعی		بحراس و حفاظ ثقات
و تشعل عندك النيران ليلا		كذلك كنت ايام الحياة
و لم ار قبل جذعك قط جذعا		تمكن من عناق المكرمات
ركبت مطية من قبل زيد		علاها فی السنين الذاهبات

واتاكەی: تۆ لەژیان و مەرگ گەورە و لەپێشیت و ئەمە بێ گومان یەكێك لەمۆجیزەكانە. وەك بڵێی كاتێك خەڵك لای (جەنازەی بێ گیانی) تۆ وەستاون، ئەو میوانانەن لەرۆژگاری پاداش و بەخششەكانی تۆ و دەڵێی تۆ لەناو ئەواندا وتار دەخوێنیتەوە و ئەوان بۆ نوێژ ریزیان بەستووە. دەڵێی تۆ دەستت بۆ پێشوازی كردن لەوان كردۆتەوە بەهەمان شێوە كە لەكاتی بەخشش دەستەكانت ئاوەڵا دەكرد. ئەو كاتەی دڵی زەوی جێگەی هەڵگرتنی تۆی لەدوای مەرگ نەبوو، ئاسمانی بۆ گۆڕی تۆ هەڵبژارد و لەجیاتی كفن، جەنازەی تۆیان لە لباوە پێچا. لەبەر گەورەیی تۆ لەدڵەكاندا شەوانە لەگەڵ پارێزەر و پاسەوانە بڕواپێكراوەكان دەپارێزرێیت. شەوانە لای جەنازەی تۆ ئاگر دادەگیرسێت بەهەمان شێوە كە تۆ لەكاتی ژیان (بۆ میوانداری كردنی میوانەكان) ئاگرت دادەگیرساند. پێشتر هیچ كات جەستەیەكم وەك جەستەی تۆ نەبینیوە كە هاوئامێزی گەورەییەكان بێت. تۆ سوار چوارپێیەك بوویت كەساڵەكانی پێش زەید سواری ببوو.

ئەمە قەسیدەیەكی دوور و درێژە و مەبەستی لەزەید، زەید كوڕی عەلی كوڕی حسەین كوڕی عەلی كوڕی ئەبی تالیبە ئەو كاتەی لەرۆژگاری هوشام كوڕی عەبدولمەلیك كوژرا و جەنازەكەیان هەڵواسی -- پێشتر ئاماژەمان پێداوە-. كوڕی بەقیە بەدارەوە مایەوە تا رۆژگاری سەمسام ئەلدەولە دایان گرت و بەخاكیان سپارد.

## چۆنیەتی مەرگی بەختیار

كاتێك بەختیار بەغدادی بەجێهێشت لەگەڵ حەمدان كوڕی ناسر ئەلدەولە كوڕی حەمدان رێگەی شامی گرتەبەر و كاتێك گەیشتە عوكبرا، حەمدان تەماحی گرتنی موسڵ و بەدەست هێنانی سامانەكانی ئەودیارەی خستە بەردەم و پێی وت موسڵ دەوڵەمەندتر و ئاسانتر لەشام دەستی بەسەردا دەگیرێت.

بەختیار بەرەو موسڵ بەرێکەوت. عێزەد ئەلدەولە سوێندی لەبەختیار وەرگرتبوو تا هێرش نەکاتە سەر سنووری باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان چوونکە لەنێوان ئەو و عێزەد ئەلدەولە پەیوەندی دۆستایەتی بەهێز گرێ درابوو و نامەیان بۆ یەك دەنارد بەڵام بەختیار پەیمانی شکاند و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر. کاتێك بەختیار گەیشتە تکریت، نێردراوانی باوکی تەغلەب هاتنە لای و داوایان لێکرد ئەگەر براکەی باوکی تەغلەب، کوڕی حەمدان، بگرێت و تەسلیم بەباوکی تەغلەبی بکات، باوکی تەغلەب و سوپاکەی پەیوەستی بەختیار دەبن و شان بەشانی ئەو دژی عێزەد ئەلدەولە دەجەنگێت و بەختیار بۆ سنوورەکەی، بەغداد، دەگەڕێتەوە. بەختیار، حەمدانی گرت و ئەوی تەسلیم بەنوێنەرکانی باوکی تەغلەب کرد. باوکی تەغلەب ئەوی لەقەڵاکەی خۆی زیندانی کرد. بەختیار ڕۆشتە حەدیسە و پەیوەستی باوکی تەغلەب بوو و هەموان پێکەوە بەرەو عێراق بەرێکەوتن. نزیکەی بیست هەزار جەنگاوەر هاوڕێیەتی باوکی تەغلەبیان دەکرد.

کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە بەغداد وعێزەد ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە، لەبەغدادەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ڕۆشت و لەهەژدەی شەوال/ سەرەتای مەی ٩٧٩ زایینی لەکۆشکی ئەلجەس لەدەوروبەری تکریت ڕووبەرووی یەکبوونەوە. عێزەد ئەلدەولە شکستی بەهەر دوو سوپاکە هێنا(سوپای بەختیار و سوپای باوکی تەغلەب). بەختیار ئەسیر و ئەویان بردە لای عێزەد ئەلدەولە بەڵام مۆڵەتی سەردانی پێنەدا و فەرمانی کوشتنی دەرکرد. بەختیاریان کوشت. باوکی وەفا تاهیر کوڕی ئیبراهیم، عێزەد ئەلدەولەی بۆ ئەم کارە هاندا. ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی بەختیار کوژران و دواتر فەرمانڕەوایەتی بۆ عێزەد ئەلدەولە سەقامگیر بوو. بەختیار لەکاتی مەرگ سی و شەش ساڵ زیاتر تەمەنی نەبوو و بۆ ماوەی یانزە ساڵ و چەند مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد.

## زاڵبوونی عێزەد ئەلدەولە لەسنووری مناڵەکانی حەمدان

کاتێك باوکی تەغلەب و بەختیار شکستیان خوارد، عێزەد ئەلدەولە بەرەو موسڵ بەرێکەوت و لەدوانزەی زیقەعدە/ بیست و دووی جون ئەو شارە و کەنارەکانی دەوروبەری خستە ژێر فەرمانی خۆی. باوکی تەغلەب گومانی دەکرد عێزەد

ئەلدەولەیش وەك کەسانی دیکە ماوەیەکی کەم لەو شارە دەمێنێتەوە و دواتر بەناچاری بەسازان و ئاشتی ڕازی دەبێت و دەگەڕێتەوە.

عێزەد ئەلدەولە دوورئەندێشتر لەوە بوو کەباوکی تەغلەب گومانی دەکرد. کاتێك عێزەد ئەلدەولە مەبەستی موسڵی کرد، لەگەڵ خۆی خواردەمەنی و ئالیکی برد و کەسانێکی لەناو سوپاکەی جێگە کردەوە کەشارەزای موسڵ و کەنارەکانی بوون. ئەو ئاسوودە لەموسڵ مایەوە و چەندین دەستەی بۆ گرتنی باوکی تەغلەب ڕەوانە کرد. باوکی تەغلەب کەسی نارد و داوای کرد عێزەد ئەلدەولە مۆڵەتی پێبدات تا ئەو بەڵێنی کۆکردنەوەی باجی ئەم دیارە بدات بەڵام عێزەد ئەلدەولە ڕازی نەبوو و وتی: ئەم سەرزەمینەم لەعێراق زیاتر خۆش دەوێت.

مەرزوبان کوڕی بەختیار، باوکی ئیسحاق و باوکی تاهیر دوو کوڕەکەی مۆعێز ئەلدەولە و دایکیان، دایکی بەختیار و کاڵا و سامانەکانیان لەگەڵ باوکی تەغلەب بوون. باوکی تەغلەب ڕێگەی نەسیبینی گرتەبەر. عێزەد ئەلدەولە دەستەیەکی بەفەرماندەیی پەردەدارەکەی، باوکی حەرب توغان بۆ دوورگەی کوڕی عومەر نارد و دەستەیەکی بۆ گرتنی باوکی تەغلەب ڕەوانە کرد. باوکی وەفا تاهیر کوڕی محەممەدی وەك فەرماندەی ئەو دەستەیە دەستنیشان کرد و ئەو لەڕێگەی سنجارەوە بەرێکەوت. باوکی تەغلەب ڕۆشت و خۆی گەیاندە مەیافارقین و لەگەڵ کەسەکانی لەوێ مایەوە بەڵام کاتێك لەهاتنی باوکی وەفا بۆ گرتنی خۆی ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ ژنان و کەسانی دیکە ڕێگەی بەدلیسی گرتەبەر. باوکی وەفا گەیشتە مەیافارقین. خەڵك دەروازەکانی شارەکەیان بەڕوودا بەست. ئەم شارە، یەکێك لەسەنگەرە گرنگەکانی ڕۆمی باستان هەژمار دەکرا. باوکی وەفا لەم شارە چاوی پۆشی و شوێنپێی باوکی تەغلەبی هەڵگرت.

باوکی تەغلەب لەئەرزەن ڕۆم بەرەو حەسەنییە لەکەنارەکانی جەزیرە بەرێکەوت و ڕۆشتە قەڵای کەواشی و قەڵاکانی دیکە و سامانەکانی هەڵگرت. باوکی وەفا بۆ مەیافارقین گەڕایەوە و گەمارۆی خستەسەر.

کاتێك عێزەد ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە باوکی تەغلەب بەرەو قەڵاکانی ئەو دێت، خۆی بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت بەڵام نەیتوانی بیگرێت. لەم ناوەدا زۆربەی

هاوەڵانی باوکی تەغلەب داوای ئەمانیان لەعیزەد ئەلدەولە کرد و عیزەد ئەلدەولە بۆ موسڵ گەڕایەوە و سوپایەك لەهاوەڵانی خۆی بەفەرماندەیی پیاوێك بەناوی توغان بۆ شوێنکەوتنی باوکی تەغلەب ڕەوانە کرد. باوکی تەغلەب لەلاریکانەوە بەرەو بەدلیس بەرێکەوت و مەبەستی سەرزەمینی ڕۆمی کرد تا پەیوەستی پاشای ڕۆمییەکان، وەرد، ببێت. وەرد لەبنەماڵەی پاشایەتی نەبوو و بەزۆر فەرمانڕەوایەتی ڕۆمییەکانی گرتبووە دەست، ڕۆمییەکان بۆ هاتنە سەرکاری ئەو ناسازگار بوون و یەکێك لەپاشازادەکانیان هێنایە سەر تەخت. بەم شێوەیە جەنگێکی دوور ودرێژ دەستی پێکرد. وەرد کچی باوکی تەغلەبی کردە هاوسەری خۆی تا بەهۆی هێزی باوکی تەغلەب، بەهێز ببێت بەڵام بەرێکەوت، باوکی تەغلەب نیازمەندی هاوکاری ئەو بوو.

کاتێك باوکی تەغلەب گەیشتە بەدلیس، سوپای عیزەد ئەلدەولەی لەو شارە بینی. سەربازەکانی عیزەد ئەلدەولە باسی فراوانی سامانی باوکی تەغلەبیان بیستبوو و چاوی تەماحیان بڕیبووە بەدەست هێنانی ئەو سامانە. کاتێك ڕووبەڕوویان بوونەوە، فەرماندەکەیان هاواری کرد: ئەم سامانە تاڵان مەکەن چوونکە هەمووی تایبەتە بەعیزەد ئەلدەولە. سەربازەکان بەبیستنی ئەم وتانە ورەیان نەما و لاوازییان لەخۆیان نیشاندا. باوکی تەغلەب کاتێك هەستی بەلاوازی ئەوان کرد، هێرشی کردەسەریان و سوپای عیزەد ئەلدەولە هەڵات و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و باوکی تەغلەب لەدەستی ئەوان ڕزگاری بوو. باوکی تەغلەب لەقەڵای زیاد کەهەنووکە بەخەرتبەرت دەناسرێت، دابەزی. لەم کاتەدا وەرد پەیکی بۆ لای باوکی تەغلەب نارد و ئاگاداری کردەوە کەڕۆمییەکان دژی ئەو یەکیان گرتووە و داوای هاوکاری لێکرد. باوکی تەغلەب وەڵامی دایەوە: هەرکات لەکێشەکانی خۆم ڕزگارم بوو، بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە. باوکی تەغلەب دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ هاوکاری ئەو نارد بەڵام وەرد شکستی خوارد و کاتێك باوکی تەغلەب ئەم هەواڵەی پێگەیشت، لەهاوکاری ئەو بێ هیوا و بۆ سەرزەمینە ئیسلامییەکان گەڕایەوە و ڕۆشتە ئامەد (دیاربەکر). دوو مانگ لەو شارە مایەوە تا ئەوەی مەیافارقین دەستی بەسەردا گیرا.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەئاسمانی ئەفریقییە لەنێوان ڕۆژهەڵات و باکوور سوورییەك هاوشێوەی بڵێسەی ئاگر دەرکەوت. خەڵکان هاتنەدەر و لەدەرگای خواوەند پاڕانەوە. لەمەهدییە چەندین ئەردهەژێنی مەترسیدار ڕوویدا و چل ڕۆژ درێژەی کێشا تا ئەو جێگەی خەڵکان ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا عەزیز باللە عەلەوی، فەرمانڕەوای میسر و ئەفریقییە سەرکردەیەکی بۆ حاجییەکان هەڵبژارد تا ئەوان بۆ مەککە ببات و لەمەککە بەناوی ئەو وتار خوێندرایەوە. سەرپەرەستی حاجییەکان لەم ساڵەدا بادیس کوڕی زیری برای یوسفی بولکین، جێگری عەزیز لەئەفریقییە بوو. کاتێك بادیس گەیشتە مەککە، دزەکان ڕۆشتنە لای و وتیان: پەنجا هەزار درهەمت لێ دەستێنین بۆ ئەوەی حەج ئەنجام بدەن و ڕێگەتان لێ نەگرین. بادیس پێی وتن: ڕازیم، هەنووکە هاولآنی خۆتان کۆبکەنەوە تا پەیمان بەهەمووتان بدەم. دزەکان هەموویان کۆبوونەوە. ژمارەیان سی و چەند کەس بوو. بادیس پرسی: ئایا کەس لەئێوە ماوەتەوە؟ ئەوان سوێندیان خوارد کەکەس نەماوەتەوە. بادیس دەستی هەموویانی بڕی.

لەم ساڵەدا ئاوی دیجلە زیادی کرد و ژمارەیەکی زۆری لەبەشی ڕۆژهەڵاتی بەغداد نغرۆ کرد و گۆڕەکانی لەباب ئەلعەین لەبەشی ڕۆژئاوای بەغداد بردە ژێر ئاو. کرێی کەشتییەکان زیادی کرد و نزیك بوو خەڵکان لەناو بچن کەئاو دامرکایەوە و خەڵکان لەزیان ڕزگاریان بوو.

لەم ساڵەدا قازی ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان ناسراو بەقورەیعە مرد. ساڵەکانی ژیانی لەشەست و پێنج کۆتایی پێهات.

لەم ساڵەدا بوو قازی عەبدجەبار لەڕەی خەلآتی پێ بەخشرا و قازییەکانی ئەو شارە و سەرزەمینەکانی ژێر فەرمانی مۆئەییەد باللە بەو سپێردرا. ئەو لەپێشەواکانی موعتەزیلە بوو و لەشی کردنەوەی نووسینەکانی بەقازی قازییەکان ناو دەبرێت کەمەبەست لێی قازی قازییەکانی شاری ڕەی یە. دەستەیەك لەنائاگاکان گومان دەکەن ئەو قازی قازییەکان بووە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەشت و هەشتی کۆچی( ٩٧٨و٩٧٩ زایینی )

### دەست گرتن بەسەر مەیافارقین و ئامەد و سەرزەمینەکانی دیکەی بەکر بەدەستی عیزەد ئەلدەولە

کاتێک باوکی وەفا لەشوێنکەوتنی باوکی تەغلەب دەستی هەڵگرت، بۆ مەیافارقین گەڕایەوە. لەو کاتەدا هەزار مەرد فەرمانڕەوای ئەم شارە بوو کەدەستی بەسەر شارەکەدا گرتبوو و لەجەنگ دژی باوکی وەفا سێ مانگ پێداگری کرد. دواتر هەزار مەرد مرد و باوکی تەغلەبیان لەمەرگی ئەو ئاگادار کردەوە. ئەو فەرمانیدا کۆیلەیەك لەحەمدانییەکان بەناوی مونس جێگەی ئەو بگرێتەوە. ئەو کاروباری شارەکەی بەڕێوەدەبرد و باوکی وەفا کەدەبوا دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت، لەمەبەستەکەی چاوی پۆشی و نامەی بۆ یەکێك لەگەورەکانی شارەکە بەناوی ئەحمەد کوڕی عوبەیداللە نووسی و ڕێزی گرت. ئەحمەد بەخواستەکانی باوکی وەفا ڕازی و دڵنیایی خەڵکانی بۆ باوکی وەفا بەدەست هێنا و خەڵکیش باوەڕیان بەوتەکانی کرد. بەم شێوەیە پێگەی باوکی وەفا بەرز بوەویەوە و کەسی بۆ لای مونس نارد و داوای کلیلەکانی شاری لێکرد. مونس لەبەر زۆری شوێنکەوتەکانی نەیتوانی بەرپەرچی داواکەی بداتەوە و کلیلەکانی بۆ نارد و داوای لەئەحمەد کوڕی عوبەیداللە کرد ئەمانی لەباوکی وەفا بۆ وەربگرێت. ئەحمەد ئەو کارەی کرد و باوکی وەفا بەمونس و خەڵکانی شارەکە ئەمانی بەخشی. دەروازەکانی شارەکەیان بۆ کردەوە و شارەکەی تەسلیم کرا.

باوکی وەفا لەکاتی مانەوەی خۆی لەمەیافارقین دەستە جەنگاوەرەکانی خۆی بۆ قەڵاکانی دەوروبەر نارد و دەستی بەسەر هەموواندا گرت. باوکی تەغلەب کاتێك ئەمەی بیست، لەگەڵ خوشکەکەی، جەمیلە، لەئامەدەوە بەرەو ڕەحبە بەڕێکەوت و فەرمانی بەژمارەیەك لەکەسەکانیدا داوای ئەمان لەباوکی وەفا بکەن. ئەوان داوای ئەمانیان کرد. باوکی وەفا بەرەو ئامەد هات و گەمارۆی خستە سەر شارەکە و خەڵکانی شارەکە کاتێك باوکی وەفایان لەنزیك خۆیان بینی، ڕێگەی خەڵکانی مەیافارقینیان گرتەبەر و شارەکەیان بەو سپارد و داوای ئەمانیان لێکرد. بەم

شێوەیە باوکی وەفا دەستی بەسەر سەرزەمینەکانی بەکردا گرت. هاوەڵان و بنەماڵەی باوکی تەغلەب بەمەبەستی وەرگرتنی ئەمان پەیوەستی بوون و ئەو ئەمانی پێبەخشین و ڕێزی لەهەمووان گرت و بۆ موسڵ گەڕایەوە.

باوکی تەغلەب کەدەیویست بەرەو ڕەحبە بڕوات، پەیکی بۆ لای عێزەد ئەلدەولە نارد و داوای بەخشینی ئەوی کرد. عێزەد ئەلدەولە بەشێوەیەکی چاکە وەڵامی دایەوە و زەوییەکی زۆری بەباوکی تەغلەب بەخشی تا ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنێت. تەنیا مەبەستی ئەوە بوو سفرەی ئەو بۆ هەمیشە کۆبکاتەوە بەڵام باوکی تەغلەب رازی نەبوو و ڕێگەی شامی گرتەبەر تا پەیوەستی عەزیز باللە، فەرمانڕەوای میسر ببێت.

## زاڵبوونی عێزەد ئەلدەولە لەسەرزەمینی موزێر

سەلامەی بەرقعیدی لەلایەن باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان فەرمانڕەوایەتی موزێری دەکرد. سەعد ئەلدەولە کوڕی سەیف ئەلدەولە لەحەلەبەوە سوپایەکی بۆ ئەو دیارە ڕەوانە کرد. لەنێوان دوو سوپا جەنگ ڕوویدا. لەلایەکی دیکە سەعد ئەلدەولە نامەیەکی بۆ عێزەد ئەلدەولە نووسی و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی دەربڕی. عێزەد ئەلدەولە، نەقیب باوکی ئەحمەد، باوکی سەیید رازی بۆ سەرزەمینەکانی ژێر دەسەڵاتی سەلامە نارد. باوکی ئەحمەد دوای جەنگێکی قورس، فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچانەی گرتەدەست و خەڵکانی بۆ فەرمانبەری کردن ناچار کرد. عێزەد ئەلدەولە ڕەققەی بۆ خۆی هەڵبژارد و پاشماوەی سەرزەمینەکانی بۆ سەعد ئەلدەولە بەجێهێشت. ئەم سەرزەمینانە کەوتنە ناو سنووری دەسەڵاتی سەعد ئەلدەولە.

دواتر عێزەد ئەلدەولە دەستی بەسەر ڕەحبەدا گرت و دواتر بۆ گرتنی قەڵاکانی ئەو کەنارانە وەك قەڵای کەواشی، کەگەنجینە و سامانی زۆری لێ بوو، هەروەها قەڵای هەرور، مەلاسی، بورقی، شەعبانی و قەڵاکانی دیکە، هەموو هەوڵەکانی خۆی خستە گەڕ و کاتێك دەستی بەسەر هەموو سنووری باوکی تەغلەبدا گرت، باوکی وەفای وەك جێگری خۆی لەموسڵ بەجێهێشت و لەکۆتایی زیقەعدە/ سی و

یەکی مەی ٩٧٩ زایینی بۆ بەغداد گەڕایەوە و خەلیفە تائیع و دەستەیەك لەسوپاییەکان و کەسانی دیکە پێشوازییان لێکرد.

## فەرمانڕەوایی قەسام لەدیمەشق

کاتێك فەتکین- وەك ئاماژەی پێدرا- دیمەشقی بەجێهێشت، قەسام وەك سەروەری خەڵکانی شارەکە دەرکەوت. چۆنیەتی ئەم سەروەرییە بەم شێوە بوو: فەتکین ئەوی لەخۆی نزیك کردەوە و بەکەسێکی بڕواپێکراوی دەزانی و بەشێکی زۆری کاروبارەکانی خۆی بەو سپارد. بەم شێوەیە ناوی قەسام کەوتە سەرناوان و لەناو گەنجەکان، ژمارەیەکی زۆر شوێنیکەوتن و دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت و فەرمانڕەوایەتی شارەکەی گرتەدەست.

باوکی مەحمودی سەرکردە کە لەلایەن عەزیز باللە وەك کارگوزاری شارەکە گەڕابوویەوە، بەبوونی قەسام نەیتوانی هیچ کارێك بکات و کەس گوێی لەوتە و فەرمانەکانی ئەو نەدەگرت و لەدیمەشق، فەرمانەکانی قەسام جێبەجێ دەکران. ئەو پێشنیاری پەیوەست بوونی خەڵکانی بەعەزیز باللە دەکرد.

وەك ئاماژەی پێدرا باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان تێکشکاو گەیشتە لای ئەو بەڵام قەسام ڕێگەی ڕۆشتنە ناو شارەکەی لێگرت و لەوە ترسا نەکا باوکی تەغلەب بەزۆر یا بەفەرمانی عەزیز دەست بەسەر دیمەشقدا بگرێت. باوکی تەغلەب ترسا و لەنێوان هاوەڵانی قەسام و سوپاکەی باوکی تەغلەب جەنگێکی نەزۆر قورس روویدا و باوکی تەغلەب ڕێگەی تەبەرییەی گرتەبەر.

لەم کاتەدا سەرکردەیەك بەناوی فەزڵ، لەگەڵ سوپایەك لەلایەن عەزیز گەیشتە دیمەشق و گەمارۆی خستەسەر بەڵام نەیتوانی بڕواتە ناو شارەکە و ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر. قەسام تا ساڵی ٩٧٩/٣٦٩ زایینی فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی لەدەستدا بوو. دواتر ئەمیرێك لەمیسرەوە بەرەو دیمەشق بەڕێکەوت بەناوی سەلمان کوڕی جەعفەر کوڕی فەلاح. کاتێك گەیشتە دیمەشق، لەدەرەوەی شارەکە ئوردووی لێدا بەڵام نەیتوانی بڕواتە ناو شارکە. ئەو ماوەیەك مایەوە و ڕێگەی نەدا خەڵك دەست بۆ کەرەستەی جەنگ ببەن بەڵام کەس گوێڕایەڵی وتەکانی نەبوو.

قەسام هاوەڵانی بۆ جەنگی سەلمان هاندا و دوای جەنگ، سوپاکەی سەلمانیان بەپاشەکشێ ناچار کرد.

ئەو لەم کاتەدا لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکان لەمزگەوتا بوو. نامەیەکی نووسی وبۆ عەزیز باللە ی نارد کە لەکاتی ئەم شۆڕشە لەمزگەوت بووە و بەشداری نەکردووە. ئەو کاتە بەشداری جەنگ دەکات کەعێزەد کوڕی بویە لەگەڵ سوپاکەی هێرشی بکەنەسەر و لەم ڕۆژەدا خۆی ڕێگەی ڕۆشتنە ناو شامی لێدەگرێت. عەزیز باللە قەسامی بەم بارودۆخە بەجێهێشت چوونکە لەوە دەترسا عێزەد ئەلدەولە هێرش بکاتە سەر شام. کاتێك سەلمان شامی بەجێهێشت، باوکی مەحمودی سەرکردە بۆ دیمەشق گەڕایەوە بەڵام گرنگی پێنەدەدرا و قەسام فەرمانی کاروبارەکانی دەدا. ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا چەندین ئەردهەژێنی مەترسیدار ڕوویدا کەمەترسیدارترینیان لەعێراق بوو.

لەم ساڵەدا قازی باوکی سەعید حەسەن کوڕی عەبدوڵلەی سیراف، نەحوی، نوسەری شرۆڤە کردنەوەی کتێبی سیبویە، کەهەم فەقیە بوو هەم زانا، هەم ئەندازیار و هەم لۆژیکی و شارەزای ئەم زانستانە بوو، لەتەمەنی هەشتا و چوار ساڵی مرد. دوای ئەو باوکی محەممەد کوڕی مەعروف حاکم لەبەشی ڕۆژهەڵاتی بەغداد وەك قازی دەستنیشان کرا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و شەست و نۆچی کۆچی ( ٩٧٩و٩٨٠ زایینی )

## کوژرانی باوکی تەغلەب کوڕی حەمدان

لەسەفەر/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە، باوکی تەغلەب، فەزڵ الله کوڕی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان کوژرا.

چۆنیەتی کوژرانی ئەو – وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا– بەم شێوە بوو کەرێگەی دیمەشقی گرتەبەر و دیمەشق لەم کاتەدا – وەك باسمان کرد– لەژێر فەرمانی قەسام بوو. باوکی تەغلەب نەیتوانی بڕواتە ناو شارەکە، لەدەرەوەی شارەکە ئوردووی لێدا و پەیکی بۆ لای عەزیز میسری نارد و بۆ گرتنی دیمەشق داوای هاوکاری لێکرد و بەم شێوەیە سوپاکەی ئەو ڕووبەڕوو سوپای قەسام بوویەوە. باوکی تەغلەب ڕۆشتە نەوی، لەکەنارەکانی دیمەشق. لەم کاتەدا نامەی پەیکەکەی لەمیسرەوە گەیشت کەعەزیز دەخوازێت بڕۆیتە بارەگاکەی تا سوپایەك لەگەڵ تۆ ڕەوانە بکات. باوکی تەعلەب رازی نەبوو. پەیکەکان هاتوچۆیان دەکرد و سەرئەنجام باوکی تەغلەب، بەرەو زەریاچەی بەحرەی تەبەرییە بەرێکەوت و عەزیز بالله سوپایەکی بەفەرماندەی فەزڵ بۆ دیمەشق نارد. فەزڵ لەتەبەرییە چاوی بەباوکی تەغلەب کەوت و بەنوێنەرایەتی عەزیز بەڵێنی هەموو شتێکی پێدا. باوکی تەغلەب ویستی لەگەڵ ئەو بەرەو دیمەشق بڕوات بەڵام فەزڵ ڕێگەی ئەو کارەی لێ گرت چوونکە لەنێوان سوپای ئەو سوپای قەسام جەنگ ڕوویدابوو و ئەم کارە قەسامی دەترساند. فەزڵ دەیویست بەشێوەیەکی ئاشتییانە دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت بەڵام کاتێك ڕۆشتە دیمەشق، توانای گرتنی شارەکەی نەبوو.

دەغفەل کوڕی مەفرەج کوڕی جەراحی تائی فەرمانڕەوایەتی کەنارەکانی ڕەمڵەی گرتبووە دەست. ئەو وای نیشاندەدا ملکەچی فەرمانەکانی عەزیز باللە یە بێ ئەوەی بەپێی فەرمانەکانی ئەو بجووڵێتەوە. شوێنکەوتە و سوپاکەی فراوان بوون و ڕووی کردە ئەحیای عوقەیل کە لەشام مابوویەوە بۆ ئەوەی لەشارەکە دەریپەڕێنێت. ئەم ژنە ڕۆشتە لای باوکی تەغلەب و داوای هاوکاری لێکرد. دەغفەل

نامەیەکی بۆ باوکی تەغلەب نووسی و داوای لێکرد ئەو کارە نەکات. باوکی تەغلەب نێوەنجیگەری کرد و سەرئەنجام بەداوەری عەزیز باللە رازی بوون.

باوکی تەغلەب ڕۆشت و لەنزیک عوقەیل ئوردووی لێدا. دەغفەل و فەزڵ سوپاسالارەکانی عەزیز، لێی ترسان و گومانیان کرد باوکی تەغلەب دەیەوێت دەست بەسەر ئەم ناوچانەدا بگرێت.

باوکی تەغلەب لەموحرەمی ٣٦٩/ جولای ٩٧٩ زایینی بەرەو ڕەملە بەرێکەوت. کوڕی جەڕاح و فەزڵ دڵنیا بوون کەباوکی تەغلەب مەبەستی ڕووبەروو بوونەوەی ئەوانی لەسەردایە (چوونکە هەردووکیان لەرەملە بوون). فەزڵ سوپاکەی خۆی لەکەنارەکان کۆکردەوە و دەغفەلیش تا ئەو جێگەی دەیتوانی شەڕکەری ئامادە کرد و سەربازەکان بۆ جەنگ ریزیان بەست. عوقەیل کاتێک ژمارەی فراوانی سوپاکەی ئەوی بینی، هەڵات و تەنیا حەوتسەد پیاو لەکۆیلەکانی خۆی و کۆیلەکانی باوکی لای باوکی تەغلەب مانەوە. باوکی تەغلەب رێگەی هەڵاتنی گرتەبەر بەڵام پێی گەیشتەوە. باوکی تەغلەب وەستا و بەرگری لەخۆی و هاوەڵانی کرد. لەم کاتەدا تیغێك بەرسەری کەوت و کەوتە خوار و ئەسیر کرا. ئەویان بردە لای دەغفەل و ئەویش بەزنجیر بەستییەوە.

فەزڵ ویستی بیگرێت و بیباتە لای عەزیز باللە لەمیسر بەڵام دەغفەل ترسا عەزیز ئەو پێگەی پێببەخشێت کە بەفەتکینی بەخشی و باوکی تەغلەب لای خۆی بهێڵێتەوە. لەبەر ئەمە باوکی تەغلەبی کوشت. فەزڵ بۆ ئەم کارە سەرکۆنەی کرد و سەری بڕاوی باوکی تەغلەبی بردە میسر. خوشکی باوکی تەغلەب، جەمیلە، کچی ناسر ئەلدەولە و هاوسەرەکەی، کچی مامەکەی سەیف ئەلدەولە، لەو جەنگەدا لەگەڵ باوکی تەغلەب بوون. کاتێك باوکی تەغلەب کوژرا، منداڵەکانی عوقەیل، ئەوانیان بۆ حەلەب بۆ لای سەعد ئەلدەولە کوڕی سەیف ئەلدەولە ڕەوانە کرد. ئەو خوشکەکەی خۆی (هاوسەری باوکی تەغلەبی) لای خۆی هێشتەوە و جەمیلەی خوشکی باوکی تەغلەبی بۆ موسڵ نارد. ئەویان بەباوکی وەفا جێگری عێزەد ئەلدەولە سپارد. ئەو جەمیلەی ڕەوانەی بەغداد کرد و جەمیلە لەژوورێك لەکۆشکی عێزەد ئەلدەولە زیندانی کرا.

## جەنگی حەسەن کوڕی عیمران کوڕی شاهین دژی سوپاکەی عیزەد ئەلدەولە

لەموحەرەم/ جولای ئەم ساڵە، عیمران کوڕی شاهین بەشێوەیەکی کتوپڕ مرد. ئەو بۆ ماوەی چل ساڵ فەرمانڕەوایەتی بوتەیحەی کرد. لەم ماوەدا ژمارەیەکی فراوان لەسەرکردە و خەلیفەکان هەوڵی گرتنی ئەویاندا و هەموو جۆرە فرت و فێڵێکیان بەکاربرد بەڵام خواوەند هەمیشە شەڕ و بەڵای ئەوانی لەسەر عیمران کەم دەکردەوە. عیمران کوڕی شاهین لەناو جێگەکەی و بەمەرگی سروشتی مرد.

کاتێك عیمران مرد، حەسەنی کوڕی جێگەی گرتەوە. عیزەد ئەلدەولە دووبارە چاوی تەماحی بڕییە سەرزەمینی بوتەیحە. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ وەزیرەکەی، موتەهەر کوڕی عەبدوللە، سوپایەکی رازاندەوە و سامان و کەرەستەی جەنگی خستنە بەردەست. موتەهەر لەمانگی سەفەر/ ئۆگۆست بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەو سەرزەمینە، کاری خۆی بەبەستن و گۆڕینی ڕێڕەوی ڕووبارەکان دەستپێکرد کەدەڕژانە ناو بەتائیح. بەم شێوەیە هەموو کات و سامانەکەی بەردەستی بۆ ئەم کارە بەفیڕۆدا. کاتی بەرز بوونەوەی ئاوەکان بوو و کاتێك حەسەن کوڕی عیمران لەبەشێکی ئەم ئاوبەندانە کەلێنی دروست کرد، بەرز بوونەوەی ئاو هاوکاری کرد و بەنداوە دروست کراوەکانی موتەهەر لەناوچوون.

موتەهەر هەر بەشێکی ڕووبارەکەی دەبەست، دەکرایەوە. دواتر لەنێوان موتەهەر و حەسەن جەنگی دەریایی ڕوویدا و حەسەن لەم جەنگەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. موتەهەر پیاوێکی بلەز و حەزی بەجەنگ دەکرد و لەخۆڕاگری خۆی دەدزییەوە. ئەم شکستە کاریگەری زۆری لەسەر ئەو بەجێهێشت.

لەئوردووەکەی موتەهەر، باوکی حەسەن محەممەد کوڕی عومەری عەلەوی کوفی دەبینرا. موتەهەر گومانی لێکرد کەنامەی بۆ حەسەن نووسیوە و ئەوی لەنهێنییەکانی ئاگادار کردۆتەوە. موتەهەر لەوە ترسا نەکا پێگەی لای عیزەد ئەلدەولە دابەزێت و دوژمنەکانی وەك باوکی وەفا و کەسانی دیکە، سەرکۆنەی

بکەن، لەبەر ئەمە مەبەستی خۆکوژی کرد و تیغی دەرهێنا و دەمارەکانی دەست و بازووی خۆی بڕی و خوێن فیچقەی کرد. لەم کاتەدا سەرپەرەستی سفرەکەی گەیشت و کاتێك خوێنی بینی، قیژاندی. کاتێك خەڵکان کۆبوونەوە، گومانیان کرد کەسێك ئەو بەڵای بەسەر هێناوە. ئەو کەدوایین هەناسەکانی ژیانی هەڵدەکێشا وتی: محەممەد کوڕی عومەر بۆ ئەم کارە ناچاری کردم، دواتر چاوەکانی بۆ هەمیشە بەست وئامێزی بۆ فریشتەی مەرگ کردەوە. ئەویان بردە کازەرون و لەوێ بەخاکیان سپارد.

عێزەد ئەلدەولە کاتێك لەم رووداوە ئاگادار بوویەوە، کەسی نارد تا پارێزگاری لەئوردوو و سوپاکەی بکات و لەبەرابەر وەرگرتنی پارە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ حەسەن کوڕی عیمران واژۆ بکات و چەندین کەسی وەك بارمتە لێ وەربگرێت. دوای ئەم رووداوە نەسر کوڕی هارون بەتەنیایی کاروباری وەزارەتی عێزەد ئەلدەولەی بەڕێوە دەبرد. ئەو لەم کاتەدا نیشتەجێی فارس بوو. عێزەد ئەلدەولە، باوکی رەبییان حەمد کوڕی محەممەدی هێنایە بارەگاکەی خۆی و تا گەیشتنی نەسر کوڕی هارون وەك جێگری ئەو دەستنیشانی کرد.

## جەنگی مناڵەکانی شەیبان دژی سوپای عێزەد ئەلدەولە

لەرەجەب/ ژانویەی ئەم ساڵە عێزەد ئەلدەولە سوپایەکی بۆ جەنگی مناڵەکانی شەیبان ڕەوانە کرد. مناڵەکانی شەیبان لەهێرشی لەناکاوی شەوانە و خراپەکاری زێدەڕۆییان دەکرد و فەرمانڕەوای شارەکان توانای شوێنکەوتنی ئەوانیان نەبوو. ئەوان لەگەڵ کوردەکانی شارەزوور پەیوەندی خزمایەتیان بەستبوو. گرتنی شارەزوور بۆ فەرمانڕەکان بەشتێکی نەکران دەهاتە بەرچاو. عێزەد ئەلدەولە فەرمانی گرتنی شارەزووری بەسوپاکەیدا تا هیوای مناڵەکانی شەیبان بۆ پەنا گرتن لەم ناوچە ببێتە بڵقی سەرئاو. سوپای عێزەد ئەلدەولە دەستیان بەسەر ئەو ناوچەدا گرت. مناڵەکانی شەیبان هەڵاتن و سوپا شوێنیان کەوت. لەنێوان ئەم دوو سوپایەی جەنگی مەترسیدار روویدا و ژمارەیەکی فراوان لەمناڵەکانی شەیبان کوژران و سامان و ژنەکانیان تالان کرا. سێسەد ئەسیر ڕەوانەی بەغداد کران.

## گەیشتنی وەردی رۆمی بۆ دیاربەکر و دەرئە نجامەکانی

لەم ساڵەدا وەردی رۆمی بۆ بەدەست هێنانی پەنا و هاوکاری عێزەد ئەلدەولە گەیشتە دیاربەکر. ئەو پەیکی بۆ لای عێزەد ئەلدەولە نارد و لەجەنگ دژی پاشای رۆم داوای هاوکاری لێکرد و بەڵێنیدا ئەگەر هاوکاری بکات، لەئەگەری سەرکەوتن بەسەر رۆم، گویرایەڵی فەرمانەکانی دەبێت و باجی بۆ دەنێرێت.

چۆنیەتی هاتنی ئەو بۆ دیاربەکر بەم شێوە بوو کاتێك ئەرمانوس، پاشای رۆم، مرد، دوو منالی بچوکی لەدوای خۆی بەجێهێشت کەدوای باوك جڵەوی کاروباری رۆمیان گرتەدەست. نەقفور کە لەو رۆژگارەدا سەرکردە بوو، هاتبووە ناو سەرزەمینە ئیسلامییەکان و وێرانی کردبوو و رێگەی گەڕانەوەی گرتبووەبەر. ئەو کاتێك لەقوستەنتەنییە نزیك کەوتەوە، لەمەرگی ئەرمانوس ئاگادار بوویەوە. سەربازەکان دەوریان گرت و وتیان: جگە لەتۆ کەس شیاوی سەرپەرەستی ئەم دوو پاشا بچوکەی نییە. ئەو رازی نەبوو. سەربازەکان پێداگرییان کرد و سەرئەنجام رەزامەندی ئەویان بەدەست هێنا و خزمەتی شازادەکانی کرد و دایکی ئەوانی کردە هاوسەری خۆی و تاجی خستەسەر.

دواتر ستەمی لەدایکی ئەو دووانە کرد و شاژن، نامەی بۆ کوڕی شەمشقیق نووسی و داوای لێکرد نەقفور بکوژێت و جێگەی ئەو بگرێتەوە. کوڕی شەمشقیق رازی و بەشێوەیەکی نهێنی لەگەڵ دەپیاو هاتە لای شاژن و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرشیان کردە سەر نەقفور و کوشتیان. کوڕی شەمشقیق سەروەرەی بەدەست هێنا و لاون، برای نەقفور، و وەردیس، کوڕی لاونی گرت و لەقەڵایەك زیندانی کردن و خۆی بەرەو شام بەرێکەوت و ڕۆشتە ئەو سەرزەمینە و چەندین بەڵای بەسەر موسوڵمانان هێنا تا گەیشتە تەرابلوس. خەڵکانی شارەکە خۆڕاگرییان کرد و ئەو گەمارۆی خستە سەریان.

دایکی دوو شازادەی رۆمی برایەکی بوو کەخواجە و لەو کاتەدا وەزیر بوو. کەسێکی بۆ ژەهر خوارد کردنی کوڕی شەمشقیق راسپارد و کوڕی شەمشقیق کاتێك ئاگادار بوویەوە ژەهرخوارد کراوە، بەخێرایی بەرەو قوستەنتەنییە گەڕایەوە

بەڵام لەرێگە لەپێ کەوت.

وەرد کوڕی مونیر کەیەکێك لەسەرکردە گەورەکانی سوپا بوو، چاوی تەماحی بڕییە فەرمانڕەوایەتی. بۆ ئەم مەبەستە نامەی بۆ باوکی تەغلەب نووسی و کچەکەی ئەوی کردە هاوسەری خۆی. ئەو لەموسوڵمانەکانی سەرسنور سوپایەکی کۆکردەوە و هەموان لەدەوری کۆبوونەوە. مەبەستی هێرش کردنە سەر رۆمی کرد. هەردوو پاشا بەردەوام سوپایان بۆ جەنگی ئەو دەنارد بەڵام رووبەرووی شکست دەبوونەوە. پێگەی وەرد بەرز بوویەوە و مەبەستی قوستەنتەنییەی کرد. دوو پاشا ترسان و وەردیس کوڕی لاونیان لەزینـدان هێنایەدەر و وەك فەرمانـدەی سوپا دەستنیشان و بۆ جەنگی وەرد ڕەوانەیان کرد. شەڕێکی مەترسیدار روویدا و سەرئەنجام وەرد بەرەو سەرزەمینە ئیسلامییەکان هەڵات و مەبەستی دیاربەکری کرد و لەدەرەوەی مەیافارقین ئوردووی لێدا و نامەی بۆ عێزەد ئەلدەولە نووسی. براکەی بۆ لای ئەو نارد تا لەملکەچ بوونی بۆ فەرمانەکانی عێزەد ئەلدەولە ئاگاداری بکاتەوە و داوای هاوکاری لێ بکات. عێزەد ئەلدەولە رازی و بەڵێنی پێدا.

دواتر دوو پاشاکەی رۆم نامەیان بۆ عێزەد ئەلدەولە نووسی و رێزیان گرت. عێزەد ئەلدەوله بەباشی زانی لایەنی دوو پاشا بگرێت و لەهاوکاری کردنی وەرد چاوپۆشی کرد. ئەو بۆ عەلی تەمیمی کە لەو کاتەدا جێگری ئەو لەدیاربەکر بوو، نامەی نووسی و فەرمانی پێدا وەرد و هاوەڵانی بگرێت. هاوەڵانی وەرد دەوریان گرت و وتیان: دوو پاشای رۆم نامەیان بۆ عێزەد ئەلدەولە نووسیوە و سەبارەت بەئێمە گفتوگۆیان کردووە. بەدڵنیاییەوە ئەوان توانیویانە رەزامەندی عێزەد ئەلدەوله بەدەست بێنن تا ئێمە تەسلیم بکاتەوە. باشترە ئەگەر دەکرێت بەئاشتی رێگەی رۆم بگرینەبەر یا لەجەنگ دژی ئەوان بکوژرێین چوونکە یا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین یا پیاوانە دەکوژرێین.

وەرد وتی: بۆچوونەکەتان هەڵەیە، ئێمە لەباشە زیاتر هیچمان لەعێزەد ئەلدەولە نەبینیوە و ڕەوا نییە پێش ئاگادار بوون لەمەبەستی ئەو، بەجێی بێڵین. ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی وەرد لێی جیابوونەوە و بەم شێوەیە باوکی عەلی تەمیمی چاوی

تەماحی تێبڕی. نامەیەکی بۆ نووسی تا سەردانی بکات. وەرد رازی بوو و کاتێك چاویان بەیەك کەوت، عەلی تەمیمی، وەرد و کوڕەکەی و براکەی و ژمارەیەك لەهاوەڵانی گرت و ئەوانی لەمەیافارقین زیندانی کرد و دواتر ڕەوانەی بەغدادی کردن. ئەوان چەند رۆژێك لەزیندان مانەوە بەڵام خواوەند فریایان کەوت – چەند و چۆنییەکەی ئاماژەی پێدەدرێت. گیرانی وەرد لەساڵی ٩٨٠/٣٧٠ زایینی بوو.

## ئاوەدانی بەغداد بەدەستی عێزەد ئەلدەولە

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە ئاوەدان کردنەوەی بەغدادی دەستپێکرد. بەغداد بەهۆی شۆڕشە فراوانەکان وێران ببوو. عێزەد مزگەوتەکان و بازارەکانی نۆژەن کردەوە و بۆ پێشنوێژەکان، بانگبێژەکان، قورئان خوێنەکان، بێ سەرپەرستان، ناتەوانان و هەژارانی مزگەوت نشین، رۆژانەی دیاریکرد و ئەو کەسانەی زەوییەکانیان وێران ببوو، ناچار کرد زەوییەکانیان ئاوەدان بکەنەوە. سەرلەنوێ جۆگە و رووبارەکانی هەڵکەند و پاکی کردنەوە و رێگەی عێراق تامەککەی سەقامگیر و ئەمن کرد و بەناتەوانەکانی مەککە و مەدینە و دانیشتووانی شوێنە پیرۆزەکان پارەیدا و خەڵکان لەشۆڕش و ئاژاوە ئاسوودە بوون. بۆ فەقیهەکان، حەدیس بێژەکان، لێکدەرەوەکان، مامۆستایانی نەحو، وتارخوێنەکان، ڕەچەڵەك ناسەکان، پزیشکەکان، ژمێریارەکان و ئەندازیاران مانگانەی دیاریکرد ورێگەیدا بەوەزیرەکەی، نەسر کوڕی هارون کەمەسیحی بوو، کەنیسەکانی خۆیان ئاوەدان و هاوکاری مەسیحییە هەژارەکان بکات.

## مەرگی حەسنەویەی کوردی

لەم ساڵەدا حەسنەوییە کوڕی حسەینی کوردی بەرزیکانی لەسەرماج کۆچی دوایی کرد. ئەو سەرکردەی سوپای بەرزیکان بوو کە بەبەرزینە ناو دەبرا. دوو خاڵەکەی، وەنداد و غانم، دوو کورەکەی ئەحمەد دوو سەرکردەی سوپایەکی دیکە بوون بەناوی عیشانییە و بۆ ماوەی پەنجا ساڵ فەرمانڕەوایەتی کەنارەکانی

دینەوەر، هەمەدان، نەهاوەند، سامغان و بەشێك لەسەرزەمینەکانی ئازەربایەجان تا سنووری شارەزوورییان دەکرد.

هەرکام لەم دووانە فەرمانندەی هەزاران سەرباز بوون. غانم لەساڵی ٩٦١/٣٥٠ زایینی مرد و کوڕەکەی باوکی سالم دەیسەم کوڕی غانم لەقەڵاکەی ئەو، قەسان، شوێنی باوکی گرتەوە تا ئەو کاتەی باوکی فەتح کوڕی عەمید ئەوی لەوێ دەپەڕاند و قەڵاکەی ئەو بەناوی قەسان و غانم ئاباد و شوێنەکانی دیکەی لێسەند.

وەنداد کوڕی ئەحمەدیش لەساڵی ٩٦٠/٣٤٩ زایینی مرد و کوڕەکەی باوکی غەنایم عەبدوەهاب جێگەی باوکی گرتەوە تا ئەوەی شارەنخان ئەسیر و تەسلیم بەحەسنەوییەی کرد و خۆی دەستی بەسەر قەڵا و زەوییەکانی ئەودا گرت.

حەسنەوییە پیاوێکی خۆشبەخت بوو، شارەزای سیاسەت و بەباشی هەڵس وکەوتی دەکرد و کارەکانی رێکدەخست، رێگەی دزی لەهاوەڵانی دەگرت. ئەو قەڵای سەرماجی بەتاشەبەردی یەکدەست دروست کرد و لەدینەوەر مزگەوتێکی گەورەی بەم شێوەیە بەرز کردەوە. ئەو پارەیەکی زۆری بۆ مەککە و مەدینە خەرج دەکرد تا ئەوەی لەم ساڵەدا کۆچی دوایی کرد و منداڵەکانی دوای خۆی بڵاو بوونەوە. دەستەیەك لەوان پەیوەستی فەخر ئەلدەولە و دەستەیەکیان پەیوەستی عێزەد ئەلدەولە بوون. ئەوانەی پەیوەستی عێزەد ئەلدەولە بوون، بریتین لە: باوکی عەلا، عەبدرەزاق،ـ باوکی نەجم بەدر، عاسم، باوکی عەدنان، بەختیار و عەبدولمەلیك.

بەختیار لەقەڵای سەرماج مایەوە و سامان و پاشەکەوتێکی زۆری پێبوو. ئەو نامەی بۆ عێزەد ئەلدەولە نووسی و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نیشاندا بەڵام دواتر پەشیمان بوویەوە و پشتی کردە عێزەد ئەلدەولە. عێزەد ئەلدەولە سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو نارد و گەمارۆی خستەسەر و دەستی بەسەر قەڵاکەی گرت. هەروەها قەڵای براکانیشی گرت و لەناو ئەوان کاروبارەکانی بەباوکی نەجم بەدر کوڕی حەسنەوییە سپارد و بەپیاوەکانی هێزی پێبەخشی. ئەو فەرمانڕەوایەتی ئەم سنوورەی دەکرد و دەستی کوردە شۆڕشگێرەکانی لەو ناوچەیە کورت کردەوە و پێگەی بەرز بوویەوە. پیاوێکی بیرمەند بوو.

## ڕەوانە بوونی عیزەد ئەلدەولە بۆ لای براکەی، فەخر ئەلدەولە و گرتنی سەرزەمینەکانی ئەو

لەم ساڵەدا عیزەد ئەلدەولە هێرشی کردە سەر سەرزەمینی چیاکان (تەبەرستان) و فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی گرتەدەست.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: بەختیار کوڕی مۆعیز ئەلدەولە دوای مەرگی ڕۆکن ئەلدەولە نامەی بۆ کوڕە مامەکەی، فەخر ئەلدەولە نووسی و داوای لێدەکرد دژی عیزەد ئەلدەولە هاوکاری بکات. فەخر ئەلدەولە ڕازی و پەیمانیان بەست.

عیزەد ئەلدەولە لەم کەین وبەینە ئاگادار بوویەوە بەڵام تا هێرش کردنە سەر سەرزەمینی چیاکان باسی نەکرد.

کاتێک عیزەد ئەلدەولە لەدوژمنەکانی خۆی وەك باوکی تەغلەب، بەختیار و کەسانی دیکە ئاسوودەبوو و حەسنەوییە کوڕی حسەین مرد، بیری لەوە کردەوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ دوو براکەی سامان بدات. نامەیەکی بۆ فەخر ئەلدەولەی برای و نامەیەکی بۆ مۆئەییەد ئەلدەولەی برای و نامەیەکی بۆ قابوس کوڕی وەشمگیر نووسی.

ئەو لەنامەکەی بۆ پشتیوانی کردنی مۆئەییەد و گوێڕایەڵ بوونی سپاسی کرد چوونکە ئەو بەتەواوی ملکەچی فەرمانەکانی عیزەد ئەلدەولە بوو.

عیزەد ئەلدەولە لەنامەکەی بۆ فەخر ئەلدەولە هەم سەرکۆنەی کرد هەم دڵنەوایی و پەیمانەکەی نێوانیانی بیر خستەوە.

لەنامەکەی بۆ قابوس کوڕی وەشمگیر خوازیاری وەفاداری ئەو لەپەیمانەکەی نێوانیان بوو.

فەخر ئەلدەولە لەوەڵامی نامەکەی عیزەد ئەلدەولە، بەلەبیر کردنی تەمەن و فراوانی سنووری دەسەڵاتی ئەو و پێشنیارەکانی باوکی، ئاڵای نافەرمانی بەرز کردەوە. قابوس وشیارانە وەڵامی دایەوە. پەیکی ئەم نامەیە خواشازە یەکێك لەهاوڕێ گەورەکانی عیزەد ئەلدەولە بوو کەدڵنەوایی کەسانی دەوروبەری فەخر

ئەلدەولەی دەکرد و بەڵێنی پێدانی زەوی پێدەدان و پەیمانی لەوان وەردەگرت. کاتێك پەیك بۆ لای عیزەد ئەلدەولە گەڕایەوە، عیزەد ئەلدەولە مەبەستی ئەوەی کرد لەبەغدادەوە هێرش بکاتە سەر چیاکان و کاروباری ئەو ناوچەیە سامان بدات. ئەو پێشتر چەند دەستەیەکی بەدوای یەکدا ڕەوانە کرد و باوکی وەفا وەك فەرماندەی سوپایەك و خواشازەی وەك فەرماندەی سوپایەکی دیکە و باوکی فەتح موزەفەر کوڕی محەممەدی وەك فەرماندەی سوپایەکی دیکە دەستنیشان کرد. سوپاکان بەرێکەوتن و خۆی لەدەرەوەی بەغداد ئوردووی لێدا. عیزد ئەلدەولە لەگەڵ ئەم سوپا گەورەیە بەرێکەوت. لەرێگە مژدەیان پێدا کەسوپاکەی ڕۆشتوونەتە ناو هەمەدان و ژمارەیەکی بەرچاو لەسەرکردەکانی فەخر ئەلدەولە و سەربازەکانی حەسنەوییە داوای ئەمانیان کردووە. باوکی حەسەن عوبەیداللە کوڕی محەممەد کوڕی حەمدویە، وەزیری فەخر ئەلدەولە، لەگەڵ ژمارەیەکی فراوان پەیوەستی عیزەد ئەلدەولە بوو. بارودۆخی فەخر ئەلدەولە لەهەمەدان پەرێشان و لەبراکەی ترسا وکوژرانی کوڕە مامەکەی، بەختیاری بیرهێنایەوە. لەبەر ئەمە هەڵات و رێگەی سەرزەمینی دەیلەمی گرتەبەر و لەوێوە بەرەو جورجان بەرێکەوت و ڕۆشتە لای شەمس ئەلمەعالی قابوس کوڕی وەشمگیر و پەنای بۆ برد. قابوس ئەمانی پێدا و پەنای پێبەخشی و زیاتر لەوەی فەخر ئەلدەولە بیری لێدەکردەوە، بەوی سپارد و ئەوی کردە شەریکی دەسەڵاتەکەی خۆی.

عیزەد ئەلدەولە دەستی بەسەر سنووری دەسەڵاتی فەخر ئەلدەولە لەهەمەدان تا ڕەی گرت و هەمووی پەیوەستی سنووری دەسەڵاتی مۆئەییەدی برای کرد و ئەوی کردە جێنشینی خۆی لەم سەرزەمینە. دواتر ڕۆشتە ڕەی و دەستی بەسەر ئەو شارەیشدا گرت.

دواتر رووی کردە سنوری دەسەڵاتی حەسنەویەی کوردی و هێرشی کردە سەر نەهاوەند و لەوێوە بەرەو دینەوەر و سەرماج بەرێکەوت و پاشماوەکانی حەسنەویەی لەسەرماج زەوت کرد. پاشەکەوتەکانی حەسنەوییە لەسەرماج فراوان بوو. عیزەد ئەلدەولە چەندین قەڵای لەقەڵاکانی حەسنەوییە گرت. لەم سەفەرەدا نەخۆشی بێهۆشی بەرۆکی گرت. لەموسڵیش ئەم نەخۆشییە دووبارە سەری

هەڵدایەوە بەڵام نەیدەهێشت کەس پێی بزانێت. بەرادەیەك شتەکانی بیردەچوو کە بەدژواری شتێکی بیر دەهێنایەوە. ئەمەیشی شاردەوە. ئەمە سرشتی جیهانە کەهەمیشە بۆ کەسێك نابێت.

منداڵەکانی حەسنەوییە هاتنە لای عێزەد ئەلدەولە. ئەو عەبد رەزاق، باوکی عەلا و باوکی عەدنانی گرت بەڵام چاکەی لەگەڵ بەدر کوڕی حەسنەوییە کرد و خەڵاتی پێبەخشی و سەرپەرەستی کوردەکانی پێسپارد. ئەمە بوو ئەوەی لەتجارب الامم باوکی عەلی کوڕی مسکویە ئاماژەی پێدراوە.

## زاڵبوونی عێزەد ئەلدەولە لەهەکاری و کەنارەکانی

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی کوردەکانی هەکاری، کەنارەکانی موسڵ، ڕەوانە کرد. ئەو ڕووبەڕوویان بوویەوە و گەمارۆی خستە سەر قەڵاکانیان. مانەوەی سوپاکەی بۆ گەمارۆ خستنە سەر قەڵای کوردان درێژەی کێشا.

کوردەکانی ناو قەڵاکان چاوەڕوانی بەفر بارین بوون تا سوپاییەکان سەرزەمینەکەیان بەجێبێڵن بەڵام خواوەند ویستی بەفر لەم ساڵەدا درەنگ ببارێت. کوردەکان کەسیان نارد و داوای ئەمانیان کرد. ئەمانیان پێبەخشرا و ئەوان قەڵاکانی خۆیان بەعێزەد ئەلدەولە سپارد و لەگەڵ سوپاکەی عێزەد ئەلدەولە رێگەی موسڵیان گرتەبەر. بەفر یەك رۆژ دوای ئەوەی کوردەکان سنووری خۆیان تەسلیم کرد، باری.

بەڵام سەرکردەی سوپاکەی عێزەد ئەلدەولە لەرێگە فریویدان و لەهەردوولای رێگەی مەعلسایا تا موسڵ، کەدوورییەکەی پێنج فەرسەنگ بوو، لەداریدان و خواوەند، خەڵکی لەبەلای ئەوان ئاسوودە کرد.[٤]

---

[٤]– ئەوەی لێرەدا باسی دەکرێت، بۆچوونی کوڕی ئەسیرەی وەگرنە پێم وانییە ئەم ڕووداوانەی لەلایەن فەرمانڕەواکانەوە بەسەر کوردەکان هاتووە مەبەستی خواوەند بووبێت چوونکە ئەم کارەستاتە دڵتەزێنانە کە بەدرێژایی مێژوو لەلایەن هەموو فەرمانڕەواکانەوە بەسەر گەلی کورد هاتووە، دەستخۆشی هیچ مرۆڤێکی راستەقینەی بەدواوە نایەت چ بگات بەخواوەند. وەرگێر.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا نێردراوانێك لەلایەن عەزیز باللە، فەرمانڕەوای میسر، هاتنە لای عێزەد ئەلدەولە و نامەکانی عەزیزی میسریان تەسلیم کرد.

لەم ساڵەدا عێزدد ئەلدەولە، محەممەد کوڕی عومەری عەلەوی قۆڵبەست و ڕەوانەی فارسی کرد. هۆکارەکەی وتەیەك بوو کەموتەهەر لەکاتی مەرگ سەبارەت بەو هێنایە سەرزمان. عێزەد ئەلدەولە کەسانێکی بۆ کوفە نارد تا سامان و دارایی ئەو زەوت بکەن. بەرادەیەك سامان وکەرەستەی جەنگی دەستکەوت کەلەژماردن نایەت. عێزەد ئەلدەولە، پێگەی براکەی ئەو، باوکی فەتح ئەحمەدی بەرز کردەوە و سەرپەرەستی حاجییەکانی پێسپارد.

لەم ساڵەدا پەیوەندی نێوان خەلیفە تائیع و عێزەد ئەلدەولە تازە کرایەوە. تائیع، کچی عێزەد ئەلدەولەی کردە هاوسەری خۆی. مەبەستی عێزەد ئەلدەولە لەم کارە ئەوە بوو کچەکەی کوڕێکی بۆ بێنێتە دنیا تا ببێتە جێگری خەلیفە و خەلافەت بۆ بنەماڵەی ئەو بگوازرێتەوە. مارەیی کچەکەی سەد هەزار دینار بوو.

لەم ساڵەدا لەنێوان موسوڵمانان و ئاگرپەرەستەکانی(زەردەشتییەکان) شیراز ئاژاوەیەکی گەورە ڕوویدا و ماڵ و حاڵی زەردەشتییەکان (وەك هەمیشە) تالان کرا و ژمارەیەکیان کوژران. عێزەد ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و سەرچاوەکانی ئەم ئاژاوەی گرت و سزایدان و لەسزادانی ئەوان زێدەڕۆیی کرد و ئەوانی دوورخستەوە.

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە دەستەیەکی بۆ عەین تەمر نارد. زەببە کوڕی محەممەدی ئەسەدی لەوێ نیشتەجێ ببوو و هاوشێوە دز و ڕێگرەکان دەجووڵایەوە. ئەو کاتێك هاتە خۆ کەرووبەرووی سوپاکەی عێزد ئەلدەولە بوویەوە. سامان و بنەماڵەکەی خۆی بەجێهێشت و تەنیا گیانی خۆی دەرباز کرد. کەسان و سامانەکەی تالان کران و عەین تەمر دەستی بەسەردا گیرا. ئەو پێشتر ئارامگای حسەین کوڕی عەلی تالان کرد.

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە، نەقیب باوکی ئەحمەد حسەینی موسەوی، باوکی

سەییدی رەزی، و براکەی، باوکی عەبدوللە، قازی قازییەکان، باوکی محەممەدی گرت و ئەوانی ڕەوانەی فارس کرد و باوکی سەعد بیشر کوڕی حسەین کەپیاوێکی بەتەمەن و لەفارس دەژیا، وەك قازی قازییەکان و سەرپەرەستی قازییەکانی بەغداد دیاریکرد. ئەو، کەسێکی وەك نوێنەری خۆی بۆ بەغداد ڕەوانە کرد.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە ئەحمەد کوڕی عەتا کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی عەتای روودباری سۆفی لەکەنارەکانی عوکا مرد. ئەو لەبەغدادەوە بۆ شام برابوو.

لەزیحەججە/ جونی ئەم ساڵە محەممەد کوڕی عیسا کوڕی عەمرویە باوکی ئەحمەدی جەلودی خۆپارێز مرد. ئەو راوی صحیحی موسلیم لەزمانی کوڕی سوفیان بوو. محەممەدیان لەحیرەی نەیشابور بەخاك سپارد. ساڵەکانی تەمەنی لەهەشتا کۆتایی پێهات.

لەم ساڵەدا باوکی حسەین ئەحمەد کوڕی زەکەریا کوڕی فارسی لوغەوی و نوسەری کتێبی (مجمل) موجمەل و چەندین کتێبی دیکە مرد. ئەو چەندین هۆنراوەیشی هەیە هاوشێوەی ئەم دوو بەیتە کەدوو رۆژ پێش مردنی هۆنییەوە:

یا رب ان ذنوبی (قد) احطت بها      علما و بی و باعلانی و اسراری

انا الموحد لکنی المقربها      فهب ذنوبی لتوحیدی و اقراری

واتاکەی: خواوەندا، تۆ لەگوناحەکانی من و ناخ و شاراوەکانی من ئاگاداریت، من تاقانە پەرەستم بەلاّم دان بەگوناحەکانی خۆمدا دەنێم، لەگوناحەکانی من لەبەر تاقانە پەرەستی و دان نان بەتاقانەیی تۆ، خۆشببە.

لەشەوالی ئەم ساڵە باوکی حەسەن سابت کوڕی ئیبراهیمی حەڕانی، پزیشکی سابی، مرد. ئەو لەساڵی ٨٩٦/٢٨٣ زایینی لەرەققە چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو کەسێکی شارەزا لەبواری پزیشکیدا بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتای کۆچی ( ٩٨٠و٩٨١ زایینی )

## سپاردنی هەمەدان بەمۆئەییەد باللە

لەم ساڵەدا ساحەب باوکی قاسم ئیسماعیل کوڕی عیباد لەلایەن مۆئەییەد ئەلدەولەوە بۆ خزمەتی عیزەد ئەلدەولە ڕۆشتە هەمەدان. ئەو عیزەد ئەلدەولەی لەملکەچی و گوێڕایەڵی مۆئەییەد ئەلدەولە ئاگادار کردەوە. عیزەد ئەلدەولە خۆی بۆ پێشوازی وەزیری براکەی ڕۆشت و ڕێزی گرت و هەمەدان و کەنارەکانی ئەو شارەی خستە ژێر فەرمانی مۆئەییید ئەلدەولەی برای. ساحەب کوڕی عیباد لای عیزەد ئەلدەولە مایەوە تا ئەو کاتەی عیزەد ئەلدەولە بۆ بەغداد گەڕایەوە و ئەوی بۆ لای مۆئەییید ئەلدەولە گەڕاندەوە. عیزەد ئەلدەولە زەوی زۆری پێبەخشی و سوپایەکی لەگەڵ نارد تا لەخزمەتی مۆئەییەد ئەلدەولەدا بێت.

## چۆنیەتی کوژرانی مناڵەکانی حەسنەوییەی کوڕی بەدر

کاتێک عیزەد ئەلدەولە خەڵاتی بەبەدر و دوو براکەی عاسم و عەبدولمەلیک بەخشی و بەدری پێش ئەوان خست و کوردەکانی خستە ژێر فەرمانی ئەو، دوو براکەی ڕژدییان پێبرد و بەم شێوەیەکی یەکیەتی ئەوان لەناوچوو و دژی براکەیان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە. عاسم کوردە ناسازگارەکانی کۆکردەوە و ئەوان پەیمانیان لەگەڵ بەست. عیزەد ئەلدەولە سوپایەکی گەورەی بۆ سەرکوتی ئەوان نارد و ڕووبەڕووی عاسم و سوپاکەی بوویەوە. ئەوان هەڵاتن و عاسم ئەسیر کرا و سوار لەسەر وشتر بردیانە هەمەدان و چیتر ناوو نیشانی نەما.

مناڵەکانی حەسنەوییە جگە لەبەدر کوژران بەڵام بەدریان نەکوشت و ئەویان لەسنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی هێشتەوە. ئەو پیاوێکی بیرمەند، فرەزان، دوورنەندێش، بەخشەر و خۆڕاگر بوو. بەخواستی خواوەند ئاماژە بەتایبەتمەندی و کردەوە چاکەکانی دەدەین.

## زاڵبوونی عیزەد ئەلدەولە لەقەڵای سندە و شوێنەکانی دیکە

لەم ساڵەدا عیزەد ئەلدەولە دەستی بەسەر قەڵاکانی باوکی عەبدوڵڵەی موڕی لەکەناری چیاکان گرت. باوکی عەبدوللە لەقەڵای سندە مابوویەوە. چەندین ماڵ و کۆشکی جوانی لەو ناوچەیە دروست کردبوو. یەکێك لەبنەماڵە دێرینەکانی ئەو دیارە بوو. خۆی و منداڵەکانی قۆڵبەست و زیندانی کران و لەزینداندا مانەوە تا ئەو کاتەی ساحەب کوڕی عیباد ئەوانی ئازاد کرد و کوڕەکەی، باوکی تاهیری، وەك دەبیری خۆی دەستنیشان کرد چوونکە باوکی تاهیر خۆش خەت و بەجوانی دەینووسی.

## جەنگی سوپای عەزیز باللە لەگەڵ سوپای کوڕی جەڕاح و دوورخستنەوەی قەسام لەدیمەشق

لەم ساڵەدا سوپاییەکانی میسر بۆ جەنگ لەگەڵ مەفرەج کوڕی جەڕاح ڕەوانە بوون.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: هێزی کوڕی جەڕاح لەسەرزەمینی فەلەستین زیادی کرد وژمارەی شوێنکەوتەکانی فراوان بوون و پێگەی بەرز بوویەوە و لەخراپەکاری و وێران کردنی شارەکان زێدەڕۆیی کرد. عەزیز باللە سوپایەکی ئامادە و بەرەو ئەو دیارە ڕەوانەی کرد و یەلتەکینی تورکی کردە فەرماندەی ئەوان. سوپا ڕێگەی ڕەملەی گرتەبەر و لەوێ ژمارەیەکی فراوان لەعەرەبەکان و قەیس پەیوەستی بوون. کوڕی جەراح دەستەیەك تیرهاوێژی لەگەڵ بوو کەهاوشێوەی تورکەکان دەجەنگان. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. یەلتەکین بۆسەی نایەوە. سەربازەکانی ناو بۆسەکان ئەو کاتەی ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند، لەپشتەوە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی کوڕی جەڕاح. سوپای کوڕی جەڕاح هەڵاتن و شمشێری میسرییەکان کەوتە ناویان. کوڕی جەراح بەدەم هەڵاتنەوە خۆی گەیاندە ئەنتاکییە و داوای پەنای

لەفەرمانڕەوای شارەکە کرد. فەمانڕەوا پەنای پێبەخشی. ئەم ڕووداوە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆشتنی پاشای ڕۆم لەقوستەنتەنییە کە لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردە سەر سنوورە ئیسلامییەکان. کوڕی جەڕاح ترسا و نامەی بۆ بەکجور لەحیمس نووسی و پەنای بۆ برد.

سوپاییەکانی میسر دوای ئاسوودە بوون لەجەنگی کوڕی جەڕاح، ڕۆشتنە ناو دیمەشق و قەسامیان فریودا. وایان نیشاندا بۆ ڕێکخستنی و لەناو بردنی ئەو کەسانەی زیان و ستەم لەخەڵکان دەکەن، هاتوونەتە ئەو شارە. فەرمانڕەوای دیمەشق، باوکی مەحمود لەساڵی ٩٨٠/٣٧٠ زایینی مردبوو. ئەو کاتێکیش زیندوو بوو کەس گوێرایەڵی فەرمانەکانی نەبوو. خەڵکانی ئەم شارە ملکەچی فەرمانەکانی قەسام بوون. کاتێك باوکی مەحمود مرد، خوشکەزاکەی، جەیش کوڕی سەمسامە، جێگەی ئەوی گرتەوە. جەیش بەگومانی ئەوەی یەلتەکین مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری شارەکەی هەیە، پێشوازی لێکرد. یەلتەکین فەرمانی پێدا سەربازەکانی پەیوەستی بن و لەدەرەوەی شارەکە ئوردوو لێ بدەن. ئەو کارەیان کرد. لەم کاتەدا قەسام هۆشداری و فەرمانی ئامادە بوون بۆ جەنگی بە سەربازەکانیدا. دوو سوپا چەندین جار ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و سەرئەنجام سوپای یەلتەکین سەرکەوتنی بەدەست هێنا و گەیشتە کەنارەکانی شار و دەستی بەسەر شاغوردا گرت و ئەوەی دەستی کەوت، تالآنی کرد و سووتاندی. گەورەکانی شار لەدەوری قەسام کۆبوونەوە و داوایان لێکرد بڕواتە لای یەلتەکین و ئەمان بۆ خۆی وەربگرێت. قەسام کەدوای ئەو هەموو پێگە و دەسەلآتە، ڕیسوا ببوو، وتی: چی دەخوازن، ئەنجامی بدەن.

هاوەڵآنی قەسام گەڕانەوە بەلآم بینیان ترساوە و هیچی لەدەست نایەت. لەبەر ئەمە هەرکەسەوە ڕێگەی خۆی گرتەبەر. پیرانی شارەکە ڕۆشتنە لای یەلتەکین و بۆ خۆیان و قەسام ئەمانیان وەرگرت. یەلتەکین ڕازی بوو و وتی: دەمەوێت ئەمڕۆ دەست بەسەر شارەکەدا بگرم. پیرەکان وتیان: چۆن دەخوازیت با وابێت. ئەو کارگوزارێکی بۆ شارەکە نارد بەناوی کوڕی خەتەڵخ. سوار و پیادەکان هاورێیەتی کوڕی خەتەڵخیان دەکرد.

سەرەتای ئەم جەنگ و گەمارۆیە بیستی موحەرەمی ٣٧٠/ حەوتی ئۆگۆستی ٩٨٠ زایینی و ڕۆشتنە ناو شارەکە لەبیست و حەوتی موحەرەم/ چواردەی ئۆگۆست بوو. یەلتەکین دەستدرێژی نەکردە سەر قەسام و هاوەڵانی. قەسام دوو ڕۆژ لەشارەکە مایەوە و دواتر خۆی داشارد. یەلتەکین سامانی ئەو و ماڵەکانی تەنیشت ماڵەکانی قەسامی زەوت کرد و دواتر خۆی بەرەو خێوەتەکان بەڕێکەوت. قەسام لەم کاتەدا ڕۆشتە لای پەردەدارەکەی یەلتەکین و خۆی پێ ناساند. ئەو قەسامی گرت و بردییە لای یەلتەکین. یەلتەکین ئەوی بۆ میسر نارد. لەوێ عەزیز باللە ئازادی کرد و خەڵکان لەزۆرداری و ستەمکاری ئەو و هاوەڵان و شوێنکەوتەکانی ئاسوودە بوون.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی محەممەدی ئەحدەبی مەزور کۆچی دوایی کرد. ئەو بەشێوەیەك هاوشێوەی خەتی کەسانی دیکەی دەنووسی کەکەس هەستی بەجیاوازی نەدەکرد. عێزەد ئەلدەولە هەرکات دەیویست ئاژاوە لەنێوان کارگوزارەکان بنێتەوە، فەرمانی بەو دەدا بەخەتی خۆی نامە بۆ یەك لەکارگوزارەکان بنووسێت و پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو کەسە خوازراوە بشێوێنێت. دواتر نووسراوەکەی دەگەیاندە دەست کەسی مەبەست.

لەم ساڵەدا ئاوی فورات زیاتر لەساڵەکانی دیکە زیادی کرد و ژمارەیەکی زۆری دانەوێڵەی خەڵکانی لەگەڵ خۆی برد، چوارپێکان ڕەمیان کرد و پردە تازە و کۆنەکان ڕووخان و دانیشتووانی ڕۆژئاوای بەغداد لەخنکان نزیك بوونەوە. زیاد بوونی ئاو تا سێ مانگ لەدیجلە و فورات بەردەوام بوو و سەرئەنجام دامرکایەوە.

لەم ساڵەدا کچی عێزەد ئەلدەولە لەگەڵ گەوهەرە بێ ژمارەکان ڕۆشتە ماڵی خەلیفە تائیع اللە.

لەم ساڵەدا لەلایەن پاشای یەمەنەوە دیاری بەدەستی عێزەد ئەلدەولە گەیشت، عەنبەرێك لەناو دیارییەکاندا دەبینرا کەکێشەکەی پەنجا و شەش ڕەتڵ بوو.

لەم ساڵەدا باوکی فەتح ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی یەحیای عەلەوی وەك

سەرپەرەستی حاجییەکان هەڵبـژێردرا و لەمەککە و مەدینە بەناوی عەزیز باللە، فەرمانڕەوای عەلەوی میسر، وتار خوێنرایەوە.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی عەلی رازی پێشەوای فەقیهە حەنەفییەکانی رۆژگاری خۆی، مرد. ئەو کاتەی زیندوو بوو، داوایان لێکرد ببێتە قازی قازییەکان بەڵام رازی نەبوو. ئەو لەهاوەڵانی کەرخی بوو.

لەم ساڵەدا زوبەیر کوڕی عەبدواحید کوڕی موسا باوکی یەعلی بەغدادی مرد. ئەو لەبوغەوی و کوڕی ساعید حەدیسی بیستبوو، بۆ ئیسەفەهان، خوراسان، ئازەربایەجان و شوێنەکانی دیکە سەفەری کرد و لەم ساڵەدا لەموسڵ مرد.

محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی حسەین کوڕی محەممەد ئەبوبەکری موفید، ناسراو بەغەندەر، لەدەشتی بوخارا و باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عەباس کوڕی فەسانجس و باوکی محەممەد عەلی کوڕی حەسەنی ئیسفەهانی و حەسەنی کوڕی بیشر ئامەدی (دیاربەکری) مردن.

لەم ساڵەدا باوکی مەحمود ئیبراهیم کوڕی جەعفەری سەرکردە، فەرماندەی هەڵبژێردراوی عەیز باللە لەدیمەشق کۆچی دوایی کرد و دوای ئەو جەیش کوڕی سەمسامە جێگەی گرتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و یەکی کۆچی ( ٩٨١و٩٨٢ زایینی )

## دوورخستنەوەی کوڕی سیمجور لەخوراسان

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی سیمجور لەفەرماندەیی سوپای خوراسان دوورخرایەوە و حسام ئەلدەولە باوکی عەباسی تاش جێگەی گرتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك ئەمیر نوح کوڕی مەنسور، خوراسان و ماوەرا ئەلنەهری لەتەمەنی سیانزە ساڵی گرتەدەست، باوکی حسەینی عوتەبی وەك وەزیر هەڵبژارد. ئەو بەباشترین شێوە پارێزگاری لەحکومەت کرد. محەممەد کوڕی سیمجور لەکۆنەوە لەخوراسان جێگیر ببوو. مانەوەی ئەو لەم سەرزەمینە درێژەی کێشا، فەرمانبەری نەدەکرد مەگەر بەپێی خواستەکانی خۆی. لەبەر ئەمە باوکی حسەینی عوتەبی ئەوی دوورخستەوە و حسام ئەلدەولە باوکی عەباسی تاشی لەجێگەی ئەو دانا و لەم ساڵەدا لەبوخاراوە ڕەوانەی نەیشابوری کرد. تاش لەوێ مایەوە و کاروبارەکانی خوراسانی بەڕێوە دەبرد و سوپا و خەڵکانی خوراسان ملکەچ و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون.

## زاڵبوونی عێزەد ئەلدەولە لەجورجان

لەجومادی الاخرە/ دێسامبەری ئەم ساڵە عێزەد ئەلدەولە دەستی بەسەر جورجان و تەبەرستاندا گرت و قابوس کوڕی وەشمگیر، فەرمانڕەوای ئەم سەرزەمینە، ناوچەکەی بەجێهێشت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك عێزەد ئەلدەولە دەستی بەسەر سەرزەمینی فەخر ئەلدەولەی برای گرت، فەخر ئەلدەولە هەڵات و پەیوەستی قابوس بوو- پێشتر ئامارژەمان پێدا-. عێزەد ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و پەیامی بۆ قابوس نارد و پێشنیاری پێکرد داوای هەرچی دەکات (لەولآت،

سامان، زەوی، دەسەڵات) بکات و پەیمانی لێ بستێنێت بەڵام لەبەرابەردا براکەی تەسلیم بکاتەوە. قابوس رازی نەبوو و وڵامی نامەکەی نەدایەوە. عێزەد ئەلدەولە سوپایەکی بەفەرماندەیی مۆئەییەد ئەلدەولە ئامادە کرد و لەگەڵ کەرەستەی جەنگ و توێشوی پێویست بەرەو جورجانی نارد.

قابوس ئاگادار بوویەوە و هێرشی کردە سەر سوپاکەی مۆئەییەد ئەلدەولە و لەنزیك ئێستر ئاباد رووبەرووی بوویەوە. لەبەرەبەیانەوە تا نیمەرۆیان بەشەڕە شمشێر بەسەر برد و سەرئەنجام، قابوس و سوپاکەی لەجومادی الاوەل/ نۆڤەمبەر شکستیان خوارد. قابوس رووی کردە یەکێك لەقەڵاکانی خۆی کەسامان و پاشەکەوتەکانی خۆی لەوێ دانابوو. ئەوەی دەیویست هەڵیگرت و هێرشی کردە سەر نەیشابور. کاتێك ڕۆشتە ناو شارەکە، فەخر ئەلدەولە پەیوەستی بوو. هاوەڵەکانیان لەهەموو ناوچەکان کۆبوونەوە و پەیوەستیان بوون.

ئەم دووانە کاتێك گەیشتنە نەیشابور کەحسام ئەلدەولە باوکی عەباسی تاش، فەرمانڕەوایەتی خوراسانی دەکرد. حسام نامەیەکی بۆ ئەمیر باوکی قاسم نوح کوڕی مەنسور نووسی و ئەوی لەهاتنی ئەو دووانە ئاگادار کردەوە. قابوس و فەخر ئەلدەولە نامەیەکیان بۆ نوح نووسی و لەبارودۆخی خۆیان ئاگاداریان کردەوە و بۆ زاڵبوون بەسەر مۆئەییەد ئەلدەولە داوای هاوکارییان لێکرد. نوح نامەی بۆ حسام ئەلدەولە نووسی و فەرمانی پێدا رێز لەقابوس و فەخر ئەلدەولە بگرێت و سوپایەك کۆبکاتەوە و لەگەڵ ئەوان ڕەوانەی بکات بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایەتی سنوری دەسەڵاتەکەیان وەربگرنەوە. باوکی حسەینی وەزیریش نامەیەکی لەم شێوەی نووسی.

## ڕۆشتنی حسام ئەلدەولە و قابوس بۆ جورجان

کاتێك نامەکانی ئەمیر نوح بەحسام ئەلدەولە گەیشت کەبەسوپای خوراسان هاوکاری فەخر ئەلدەولە و قابوس بکات، ئەو سوپاییەکانی کۆکردەوە. بەرادەیەك لەنەیشابور سەربازی کۆکردەوە کەچیتر شوێن بۆ کەسی دیکە نەدەبینرا. ئەوان بەرەو جورجان بەرێکەوتن و لەوێ دابەزین و گەمارۆیان خستە سەر شارەکە.

مۆئەییەد ئەلدەولە لەگەڵ سوپاکەی خۆی و سوپای براکەی، عیزەد ئەلدەولە، سوپایەکی گەورەی پێکهێنا بەڵام لەسوپای خوراسان نزیک نەدەبوونەوە. حسام ئەلدەولە بۆ ماوەی دوو مانگ گەمارۆی خستە سەر شارەکە و بەیانی و ئێواریێ رووبەروویان دەبوویەوە. چیتر بەدژواری خواردەمەنی دەگەیشتە جورجان تا ئەو جێگەی دانیشتووانی جورجان توێکڵی جۆ و گڵیان تێکەڵ دەکرد و دەیانخوارد. کاتێك بارودۆخیان لێ دژوار بوو، لەمانگی رەمەزان/ فەوریە لەجورجان هاتنەدەر بۆ ئەوەی بوێرانە رووبەرووی سوپای خوراسانییەکان ببنەوە یا سەرکەوتن بەدەست بێنن یا پیاوانە بمرن. کاتێك خوراسانیەکان ئەوانیان بینی، گومانیان کرد هاوشێوەی رۆژەکانی پێشوو جەنگێکی سووك و کاتی دەبێت، بەڵام کاتێك رووبەروویان بوونەوە، پێچەوانەی گومانەکەی ئەوان بوو.

مۆئەیید ئەلدەولە پێش ئەم جەنگە، بۆ یەکێك لەسەرکردەکانی سوپای خوراسان بەناوی فائیقی خاسە نامەی نووسی و تەماحی خستە بەردەم. فائیق وەڵامی دایەوە ئەگەر سوپاکەی هێرش بکاتە سەر حسام، ئەو (فائیق) گۆڕەپان بەجێدێڵێت و رێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. بەسەرهاتی فائیق و پێگەی ئەو لەناو دەوڵەت دواتر ئاماژەی پێدەدرێت.

لەم رۆژەدا مۆئەیید باللە رووی کردە گۆڕەپانی جەنگ. سوپاکەی هێرشیان کردە سەر فائیق و سوپاکەی. فائیق و هاوەڵانی (بەهەمان شێوە کەپەیمانیان بەستبوو) هەڵاتن و سەربازەکان شوێنیان کەوتن. فەخر ئەلدەولە خۆڕاگری کرد و حسام ئەلدەولە لە گەرمەی شەڕدا شمشێری دەوەشاند . جەنگ تا کۆتایی رۆژ درێژەی کێشا و کاتێك سەربازەکان هەڵاتنی کەسانی دیکەیان بینی، رێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. سوپاکەی مۆئەییەد ئەلدەولە بەرادەیەك تاڵانیان کۆکردەوە جگە لەخوا کەس بڕ و ئەندازەکەی نازانێت.

حسام ئەلدەولە، فەخر ئەلدەولە و قابوس بۆ نەیشابور گەڕانەوە و هەواڵەکەیان بۆ بوخارا نووسی. وەڵامێکی هیوابەخشیان بۆ هاتەوە و بەڵێنیان پێدان سوپایەك بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە دەکەن و دووبارە هێرش دەکەنە سەر جورجان و ڕەی. ئەمیر نوح فەرمانی بەسوپاییەکانی دیکەدا رێگەی نەیشابور بگرنەبەر.

سەربازەکانی لەهەموو شارەکانەوە پەیوەستی ئەو سوپایە دەکرد. لەدەرەوەی نەیشابور زیاتر لەجاری یەکەم سەرباز کۆبوویەوە. حسام ئەلدەولە بەردەوام چاوەڕوانی هاتنی سەربازی زیاتری دەکرد بۆ ئەوەی ڕێگەی جورجان بگرێتەبەر. لەم کاتەدا ئاگادار بوویەوە باوکی حسەینی عوتەبی کوژراوە و ئەمە بووە هۆی ئەوەی کۆبوونەوەی سوپاییەکان بڵاوەی پێبکرێت.

هۆکاری کوژرانی عوتەبی ئەوە بوو باوکی حەسەن کوڕی سیمجور دەستەیەك لەکۆیلەکانی بۆ کوشتنی ئەو ڕاسپارد. کۆیلەکان هێرشیان کردەسەر و کوشتیان. کاتێك کوژرا، نوح کوڕی مەنسور نامەیەکی بۆ حسام ئەلدەولە نووسی و ئەوی بۆ بوخارا بانگ کردەوە تا جڵەوی کاروباری حکومەت بگرێتەدەست و ئەوەی بەهۆی کوژرانی باوکی حسەین، لەیەك پچڕاوە، پەیوەند بدات. لەبەر ئەمە حسام ئەلدەولە لەنەیشابورەوە بەرێکەوت و هەرکەس لەبکوژەکانی باوکی حسەینی بینی، سکی هەڵدڕی. باوکی حسەین لەساڵی ٩٨٢/٣٧٢ زایینی کوژرا.

## کوژرانی ئەمیر باوکی قاسم، فەرمانڕەوای سەقەلییە و شکستی فەرەنگەکان

لەزیقەعدە/ ئاوریلی ئەم ساڵە ئەمیر باوکی قاسم، فەرمانڕەوای سەقەلییە، بەمەبەستی جیهاد شارەکەی خۆی بەجێهێشت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: پاشایەك لەپاشاکانی فەرەنگ بەناوی بەردویل لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەفەرەنگەکان هێرشی کردە سەر سەقەلییە و قەڵای ماڵتە (ماڵتای) گرت و زیانی لەدوو دەستەی سوپای موسوڵماناندا. ئەمیر باوکی قاسم سوپاکەی خۆی بەرەو ئەو ناوچەیە برد تا دوژمنان لەقەڵاکە دوور بکاتەوە بەڵام کاتێك لەو سەرزەمینە نزیك کەوتەوە، ترسا و وتی: من بۆ سەرزەمینی خۆم دەگەڕێمەوە، هەوڵ مەدەن بڕیارەکەم بگۆڕم. لەگەڵ سوپاکەی گەڕایەوە.

هێزی دەریایی کافرەکان، چاودێری موسوڵمانانیان دەکرد و کاتێك گەڕانەوەی موسوڵمانانیان بینی، بەردویل، پاشای ڕۆمیان ئاگادار کردەوە و پێیان وت:

موسوڵمانان لەتۆ ترساون، خۆت بەوان بگەیێنە چوونکە سەرکەوتن بەدەست دێنێت. ئەو بارسووك و بەخێرایی رێگەی بڕی و لەبیستی موحەرەمی ٣٧٢/ شانزەی جولای ٩٨٢ زایینی پێیان گەیشتەوە. موسوڵمانان خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. دەستەیەك لەفەرەنگەکان مەبەستی هێرش کردنە سەر دڵی سوپا و ئاڵاکانیان کرد و ریزی سوپای موسوڵمانانیان شکاند. ژمارەیەکی فراوان لەموسوڵمانان لەئەمیر جیابیوونەوە. فەرەنگەکان خۆیان گەیاندە ئەمیر و شمشێرێك بەرسەری کەوت و مەرگی ئەوی لێکەوتەوە. ژمارەیەك لەگەورەکان و بوێرەکانیش لەگەڵ ئەودا کوژران.

موسوڵمانە هەڵاتووەکان کاتێك ئەم هەواڵەیان بیست، گەڕانەوە و بڕیاریاندا تا سەرەمەرگ بجەنگن بۆ ئەوەی یا سەرکەوتن بەدەست بێنن یا بکوژرێن. بارودۆخ بۆ هەردوو سوپا دژوار بوو. فەرەنگەکان ریسوایانە شکستیان خوارد و نزیکەی چوار هەزار کەسیان کوژرا. ژمارەیەك لەسەرکردەکانیان ئەسیر کرا. موسوڵمانان تا ئاوابوونی خۆر شوێنیان کەوتن و بەتاڵان کردنی سامانەکانەوە سەرقاڵ بوون. پاشای فەرەنگ لەگەڵ پیاوێکی جوولەکەی هاورێی هەڵات. ئەسپەکەی پاشا لەپێ کەوت. پیاوی جوولەکە پێی وت: سوار ئەسپەکەی من بە و غار بدە، ئەگەر من کوژرام، سەرپەرەستی کوڕەکەم بگرە ئەستۆ. پاشا سوار ئەسپەکەی بوو. پیاوی جوولەکە کوژرا. پاشا گەیشتە خێوەتی هاوسەر و منداڵەکانی. ئەوانی هەڵگرت و رێگەی رۆمی گرتەبەر.

کاتێك ئەمیر قاسم کوژرا، جابری کوڕی کە لەوگێژاوەدا لەگەڵ باوکی بوو، جێگەی گرتەوە و دەستبەجێ موسوڵمانانی لەوێ برد تا ئەو جێگەی موسوڵمانان نەیانتوانی هەموو تاڵانییەکان کۆبکەنەوە و بەشێکی زۆریان بەجێهێشت. سوپاکەی داوایان لێکرد لەوێ بمێنێتەوە تا بتوانن کەرەستەکانی جەنگ و پاشماوەی تاڵانییەکان کۆبکەنەوە و بەم شێوەیە گەنجینەکان پڕ ببێت بەڵام رازی نەبوو.

فەرمانڕەوای باوکی قاسم لەسەقەلییە دوانزە ساڵ و پێنج مانگ و پێنج رۆژ درێژەی کێشا. ئەو پیاوێکی دادپەروەر، رووخۆش، و بەبەزەیی بۆ خەڵکان بوو.

چاکەی لەگەڵ دەکردن و بەردەوام کەسەکان لەبەخششەکانی ئەو کەڵکیان وەردەگرت، هیچ درهەم و دینارێکی لەدوای خۆی بەجێنەهێشت و هەموو زەوییەکانی خۆی بۆ هەژارەکان و کارە خێرخوازییەکان تەرخان کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەکەرخی بەغداد ئاگرکەوتەوە و بەشێکی زۆری ناوچەکانی ئەو گەڕەکەی سووتاند و ژمارەیەك لەخەڵکان مردن. ئەم ئاگرە بۆ ماوەی یەك حەفتە بڵێسەی دەسەند.

لەم ساڵەدا عیزەد ئەلدەولە، قازی باوکی عەلی موحسین کوڕی عەلی تەنوخی گرت و خانەنشینی کرد. ئەو شوێنکەوتەی ئایینی حەنەفی بوو. بەرادەیەك گومانی لەئایینی شافعی دەکرد کەزمانی لەخراپەکردنی ئەوان هەڵنەدەگرت. خوا بیکوژێت.[°]

لەم ساڵەدا عیزەد ئەلدەولە، باوکی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی هیلالی سابی دەبیری لەزیندان ئازاد کرد. ئەو لەساڵی ٩٧٧/٣٦٧ زایینی، زیندانی کرابوو.

چۆنیەتی گرتنی ئەو بەم شێوە بوو: ئەو بەنوێنەرایەتی بەختیار چەندین نامەی سەبارەت بەناسازگاری ئەو دووانە (عیزەد ئەلدەولە و بەختیار) نووسی. بەردەوام مۆجیاری بەختیاری دەکرد. یەکێکی دیکە لەنووسینەکانی ئەو سەبارەت بەناسازگاری خەلیفە تائیع باللە و عیزەد ئەلدەولە بوو. نازناوی شای شاکانی بەبەختیار بەخشی و بەم شێوەیە ئایینی یەکسانی بەفیڕۆچوو. عیزەد ئەلدەولە ڕقی ئەوی لەدڵ گرت. ئەمە یەکێك لەسەرەنج ڕاکێش ترین بابەتەکانە چوونکە دەبوا سابی بۆ ئامۆژگاری کردنی هاورێکەی عیزەد ئەلدەولە، لای ئەو پێگەی بەرز بێتەوە. کاتێك عیزەد ئەلدەولە ئەوی لەزیندان هێنایەدەر، فەرمانی پێدا کتێبێك سەبارەت بەکارە چاکەکانی دەیلەمییەکان بنووسێت. ئەو کتێبی تاجی سەبارەت بەفەرمانڕەوایەتی دەیلەمییەکان نووسی.

---

[°] وا دەردەکەوێت کوڕی ئەسیر خۆی شوێنکەوتەی مەزهەبی شافعی بووبێت بۆیە بەم شێوەیە دۆعا لەو قازییە دەکات. وەرگێر.

لەم ساڵەدا عێزەد ئەلدەولە، قازی ئەبوبەکر محەممەد کوڕی تەیبی ئەشعەری ناسراو بەکوڕی باقلانی وەك باڵوێز بۆ دەرباری پاشای رۆم، لەوەڵام بۆ نامەکەی پاشای رۆم، بۆ لای ئەو نارد. کاتێك باقلانی گەیشتە لای پاشای رۆم، پێیان وت لەبەردەم پاشای رۆم سەری کوڕنوش دانەوێنێت. ئەو رازی نەبوو. پێیان وت: بۆ بینینی پاشا جگە لەکوڕنوش بردن هیچ رێگەیەکی دیکە نییە. ئەو پێداگری لەسەر نەکردنی ئەو کارە کرد. پاشا دەرگایەکی بچووکی دروست کرد تا قازی لەکاتی رۆشتنە ژوور بەناچاری بچەمێتەوە و هەموان گومان بکەن ئەو سەری کوڕنوشی دانەواندووە. کاتێك قازی دەرگاکەی بینی، هەستی بەمەبەستی پاشا کرد و بەپشتەوە رۆشتە ژوور. کاتێك رۆشتە ژوور، پاشا هەستا و پێشوازی لێکرد و بەم شێوەیە پێگەی کوڕی باقلانی لای هاوەڵانی پاشای رۆم بەرز بوویەوە.

لەم ساڵەدا نەخۆشخانەی عێزەدی لەرۆژهەڵاتی بەغداد کرایەوە و هەموو دەرمانە پێویستەکانی بۆ دابین کرا.

لەم ساڵەدا ئیمام ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیلی ئیسماعیلی جورجانی، فەقیهی شافعی، و ئیمام محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد باوکی زەیدی مەروزی، فەقیهی شافعی کەصەحیحی بوخاری لەبەر دەوتەوە، مردن. مەروزی لەمانگی رەجەب/ دێسامبەر کۆچی دوایی کرد. لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە محەممەد کوڕی خەفیفی شیرازی، شێخی سۆفییە لەرۆژگاری خۆی کەهاونشینیس جەریر و کوڕی عەتا وکەسانی دیکە بوو، مرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئیبراهیمی سۆفی، ناسراو بەحوسری، مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و دووی کۆچی (٩٨٢و٩٨٣ زایینی)

### فەرمانڕەوایی بەکجور لەدیمەشق

لەرووداوەکانی ساڵی٣٦٦/٩٧٦ زایینی ئاماژەمان بەفەرمانڕەوایەتی بەکجور لەحیمس بەنوێنەرایەتی باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمداندا. کاتێك بەکجور فەرمانڕەوایەتی ئەم شارەی گرتەدەست، ئاوەدانی کردەوە. شاری دیمەشق لەکاتی فەرمانڕەوایەتی قەسام بەدەستی عەرەبەکان و خراپەکاران وێران و خاپور کرابوو. لەبەر ئەوە خەڵکانی ئەو شارە بۆ حیمس و کەنارەکانی ئەو شارە راگوێزران وئەم شوێنانە ئاوەدان ببوونەوە و خەڵکان و کشتوکاڵ لەم ناوچەیە پەرەی سەند بەلاّم لەدیمەشق وشکەساڵی و گرانی هاتە ئاراوە و بەکجور لەحیمسەوە خواردەمەنی بۆ ئەو شارە دەنارد. بەم شێوەیە خەڵکان بۆ بردنی خواردەمەنی و پارێزگاری کردن لەرێگەکان، بۆ دیمەشق هاموشۆیان دەکرد.

بەکجور نامەی بۆ عەزیز باللە فەرمانڕەوای میسر نووسی و خۆی لەو نزیك کردەوە. عەزیز بەڵێنی فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی پێدا بەلاّم پەیمانەکەی خۆی تا ئەم ساڵە نەهێنایەدی.

لەم کاتەدا لەنێوان سەعد ئەلدەولە باوکی ئەلمەعالی کوڕی سەیف ئەلدەولە و بەکجور ناسازگاری روویدا. سەعد ئەلدەولە فەرمانی پێدا سەرزەمینەکەی بەجێبێڵێت. بەکجور پەیامی بۆ عەزیز نارد و داوای لێکرد پەیمانەکەی جێبەجێ بکات بەلاّم کوڕی کلّسی وەزیر تا ئەم ساڵە رێگەی نەبدا عەزیز باللە پەیمانەکەی بەدیبێنێت.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا یەلتەکینی سەرکردە دوای قەسام فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی دەکرد و لەوێ مابوویەوە.

لەو کاتەدا مەغاریە لەمیسر کۆبوونەوە تا دژی کوڕی کلّسی وەزیر ئالاّی شۆڕش بەرز بکەنەوە و بیکوژن. ئەو بەناچاری یەلتەکینی لەدیمەشق گەڕاندەوە. عەزیز باللە فەرمانی گەڕانەوە بۆ میسری پێدا و ئاگاداری کردەوە دیمەشق بەبەکجور

بسپێرێت. یەلتەکین وەڵامی دایەوە: ئەگەر بەکجور فەرمانڕەوایەتی دیمەشق بەدەست بێنێت، ئالای شۆڕش بەرز دەکاتەوە. عەزیز باڵلە گرنگی بەوتەکانی یەلتکین نەدا و فەرمانی پێدا بۆ میسر بگەڕێتەوە و دیمەشق بخاتە ژێر فەرمانی بەکجور. یەلتەکین ئەو کارەی کرد و بەکجور لەرەجەب/ دێسامبەری ئەم ساڵە وەك فەرمانڕەوای دیمەشق، ڕۆشتە ناو شارەکە و لەگەڵ هاوەڵانی کوڕی کلسی وەزیر و موالییەکانی ئەو خراپەکاری کردە پیشە تا ئەو جێگەی ژمارەیەك لەوانی هەڵواسی. ئەو بەشێوەیەکی خراپ مامڵەی لەگەڵ خەڵکانی شارەکە دەکرد و کەسێکی ستەمکار بوو، سامانەکانی زەوت دەکرد، خوێنی دەڕشت، خەڵکانی لەدارەداو ئەشکەنجەی دەکردن. ئەم بارودۆخە تا ساڵی ٩٨٨/٣٧٨ زایینی درێژەی کیشا و بەخواستی خوا چۆنیەتی دوور خستنەوەی ئەو باس دەکەین.

## مەرگی عێزەد ئەلدەولە

لەشەوال/ مارسی ئەم ساڵە، نەخۆشییەکەی عێزەد ئەلدەولە تەنگی پێهەڵچنی. نەخۆشییەکەی بێهۆشی بوو کەسات ناسات بەرۆکی دەگرت. ئەو توانای چارەسەر کردنی نەخۆشییەکەی نەبوو. ئەم نەخۆشییە قوڕگی دەگوشی و سەرئەنجام لەهەشتی شەوال/ بیست و حەوتی مارس لەبەغداد مرد. جەنازەی بێ گیانی ئەویان بردە بارەگای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و لەوێ بەخاکیان سپارد.

عێزەد ئەلدەولە پێنج ساڵ و نیو فەرمانڕەوایەتی عێراقی کرد و کاتێك مرد، کوڕەکەی، سەمسام ئەلدەولە باوکی کالیجار، پرسەی بۆ گێرا. تائیع بۆ دڵنەوایی کردن، ڕۆشتە لای. عێزەد ئەلدەولە لەکاتی مەرگ چل و حەوت ساڵە بوو. ئەو پێش پەرە سەندنی نەخۆشییەکەی، کوڕەکەی شەرەف ئەلدەولە باوکی فوارسی وەك فەرمانڕەوای سنوورەکانی کرمان ڕەوانە کردبوو. دەڵێن کاتێك عێزەد ئەلدەولە دوایین هەناسەکانی هەڵدەکێشا، تەنیا ئەم ئایەی دەهاتە سەر زمان: ((سامانی من، سوودی پێنەگەیاندم، دەسەڵاتی من (لەناوچوو).))[٦]

---

[٦] - حاقە/٢٨و٢٩، ما اغنی عنی مالیە، هلك عنی سلطانیە.

ئەو پیاوێکی بیرمەند، فرەزان، سیاسەتباز، گومانەکانی بەزۆری راست بوو. خاوەن شکۆ، پێگە بەرز و فرەزانەکانی خۆش دەویست، لەو شوێنی پێویست، دەیبەخشی و لەو کاتەی دەبوا، رژدی بکاتە پیشە، رژدی دەکرد، کەسێکی دوورئەندێش بوو.

دەڵێن کاتێك عێزەد مرد، یەکێك لەزاناکان لەمەرگی ئاگادار بوویەوە و دەستەیەك لەفرەزانەکان لای ئەو دانیشتبوون. ئەوان ئەو وتانەیان هێنایە سەرزمان کەبیرمەندان لەکاتی مەرگی ئەسکەندەر، هێنابوویانە سەرزمان. یەکێك لەوان وتی: ئەگەر وتەی لەو شێوە بێنە سەرزمان، دەمێنێتەوە. یەکی دیکە وتی: عێزەد ئەلدەولە جیهانی بەپێوانەکەی خۆی هەڵنەسەنگاند و بەهای زۆری پێبەخشی و بەدوای سوودەوە بوو و گیانی سوودی کرد. یەکی دیکە وتی: هەرکەس چاو بۆ ئەم دنیایە بکاتەوە، بەم شێوەیە چاو لێکدەنێت و هەرکەس وەك ئەو چاو لێك بنێت، بەم شێوەیە چاو دەکاتەوە. یەکی دیکە وتی: بیرمەندێکم لەکاتی خرۆش و نەزانێك لەبێ ئاگاییدا وەك ئەو نەبینیوە. ئەو شوێنێکی بەلاوازی بەجێدەهێشت وگومانی دەکرد، بەهێز و سەقامگیری کردووە و تالآن دەکرا و خۆی بەتالآنگەر دەزانی. یەکی دیکە وتی: هەرکەس دنیا بەجیددی بگرێت، دنیا گاڵتەی پێدەکات و هەرکەس ئەم جیهانە بەهیچ بزانێت، جیهانەکەی بەجیددی وەردەگرێت. یەکی دیکە وتی: ئەم دنیای بێ توێشوو بەجێهێشت و بێ هێز و توێشوو کۆچی کرد. یەکی دیکە وتی: ئاوێکی گەورە ئەم ئاگرەی دامرکاندەوە و ڕەشەبایەك ئەم ستوونەی لەرزاند. یەکی دیکە وتی: کەسێك تۆ تالآن دەکات کەتوانای بەسەر تۆدا هەیە. یەکی دیکە وتی: ئەگەر لەژیان وانەی وەردەگرت لەکاتی مەرگ نەدەبووە وانە بۆ کەسانی دیکە. یەکی دیکە وتی: ئەوەی بەقادرمەکانی جیهاندا سەرکەوێت دەکەوێتە خوار و ئەوەی بەقادرمەکاندا بێتەخوار، سەردەکەوێت. سەرئەنجام دەیەم کەس وتی: چۆن لەفریوی ئەم کارە بێ ئاگا بوویت کەکردەوەکانی خۆت ئەوەی لەگەڵ کردی و بۆ قەڵغانت هەڵنەگرت. لەم رووداوەدا وانەیەك هەیە بۆ ئەوانەی وانە وەردەگرن و تۆ نیشانەیەکیت بۆ خەڵکان.

عێـزەد ئەلدەولــە لەمەدینــەی پێغەمبــەر(د.خ) دیــوارێکی بــەرز کــردەوە. ئــەو هـۆنراوەی جـوانی دەهۆنییـەوە. یـەکێك لـەهۆنراوەکانی خـۆی کاتێـك هۆنییـەوە کەباوکی تەغلەب کوڕی حەمدان بۆ هاوکاری کردن دژی بەختیار داوای بەخشینی کرد و خوازیاری ئەمان بوو. عێزەد ئەلدەولە لەوەڵامدا ئەم هۆنراوەی هۆنییەوە:

| | |
|---|---|
| افاق حین وطئت ضیق خناقه | یبغی الامان، و کان یبغی صارما |
| فلارکبن عزیمة عضدیة | تاجیة، تدع الانوف رواغما |

واتاکەی: ئایا ئەو دەمە کەوتە خۆ کەقاچم خستە سەر قوڕگی و ئەو دەمە داوای ئەمانی کرد کەپێشتر خوازیاری شمشێر بوو. عێزەدییانە مەبەستی ئەوانم کرد و ئەم مەبەستە، پۆزی ئەوانی لەزەویدا.

هۆنراوەیەکی دیکەی هەیە کەکەس هاوشێوەی ئەو هۆنراوەی نییە. ئەمە چەند دێڕێکی ئەو هۆنراوەیە:

| | |
|---|---|
| لیس شرب الکاس الا فی المطر | و غناء من جوار فی السحر |
| غانیات، سالبات للنهی | ناغمات فی تضاعیف الوتر |
| مبرزات الکاس من مطلعها | ساقیات الراح من فاق البشر |
| عچدالدوله و این رکنها | ملك الاملاك غلاب القدر |

واتاکــەی: خواردنــەوەی مــەی تــەنیا لەهــەوای بــارانی و خۆشــگوزەرانی خۆشگوزەرانان تەنیا لەبەرەبەیاندا خۆشە. ئەو ئاواز خوێنانەی ئاوز لەناو دەبەن و ئەو گۆرانیبێژانەی لەناو بەربەتەوە دەنگی ئاواز بەرز دەکەنەوە. ساتەکێن، بادە بەدەست، مەی بۆ کەسێك تێدەکرد کە لەهەموو مرۆڤەکان لەپێشترە، بۆ عێـزەد ئەلدەولە منالی رۆکن ئەلدەولە، شای شاکان کەفەرمانڕەوایەتی هەموو ناوچەکان دەکات و بەسەر چارەنووسدا زاڵە.

لەدوایین دێڕ مەبەستی لەخۆیەتی.

دەگێڕنـەوە لەکۆشـکەکەی دەسـتەیەك لەکۆیلـەکان دەبینـران کەمانگانـەی ئـەوان لەگەنجینــە دەدرا. عێــزەد ئەلدەولــە، فــەرمانی بــەباوکی نەســر خواشــازەدا بەسەرپەرەستی گەنجینە بڵێت مانگانەی ئەم کۆیلانە سێ رۆژ پێش کۆتایی هاتنی مانگ بدات. باوکی نەسر دەڵێت: من چوار رۆژ ئەنجامدانی ئەم کارەم لەبیر کرد.

عێزەد ئەلدەولە سەبارەت بەفەرمانەکەی خۆی لێی پرسیم. وتم: لەبیرم چوو. عێزەد ئەلدەولە بەشێوەیەکی توند لەگەڵم ئاخاوت. وتم: دوێنێ مانگ کۆتایی هات و هەر ئێستا مانگانەیان بۆ دەنێرم و ئەمە جێگەی نیگەرانی نییە. عێزەد ئەلدەولە وتی: دەردی نەزانینی ئەم هەڵەیە زیاتر لەکەمتەرخەمی تۆیە. ئایا نازانیت ئەگەر مانگانەی ئەوان لەپێشەوە بدەین، منەتیان دەخەینە سەر بەلاّم ئەگەر تا گەیشتنی مانگی داهاتوو دوای بخەین، دەبینە کەسانێکی کەمتەرخەم و دەڕۆنە لای گەورەکانی خۆیان و داوای مانگانە لەوان دەکەن و گەورەکانیان بەڵێنیان پێدەدەن و بەم شێوەیە لەڕۆژی دووەم و سێیەم زمان دەکەنەوە. ئەوسا نەدەتوانین منەتیان بەسەر بکەین بەڵکو ئەوان بوێر دەبن و لەکۆتایی رۆژی سێیەم، لەدۆڕانەوە نزیکتر دەبین تا لەسوود.

عێزەد ئەلدەولە کاروبارەکانی بەکەسە شیاوەکان دەسپارد و رێگەی نێوەنجیگەری لەکەسە نەشیاوەکان دەبەست.

دەگێڕنەوە سەرکردەی سوپاکەی عێزەد ئەلدەولە، ئەسفار کوڕی کوردویە، سەبارەت بەیەکێك لەدادپەروەران نێوەنجیگەری کرد تا عێزەد ئەلدەولە بڕواتە لای قازی و داوای لێ بکات بەبەڵگەکانی رازی ببێت. عێزەد ئەلدەولە پێی وت: ئەمە ئەرکی تۆ نییە. ئەرکی تۆ قسە کردنە لەسەر ژمارەی سوپاییەکان و کەم و زیاد کردنی دەرەجەی ئەوان و کارە پەیوەندییدارەکان بەسوپا و بەڵگە و رازی بوون بەوەی داوای دەکەیت، پەیوەندی بەقازی هەیە و شیاو نییە من و تۆ گفتوگۆی لەسەر بکەین. هەرکات قازی دادپەروەری لەکەسێکدا ببینێت، بێ هیچ نێوەنجیگەرییەك، پێی رازی دەبێت.

ئەو لەسەرەتای هەر ساڵێك بەشێکی زۆری سامانەکەی بۆ کارە خێرخوازییەکان لەناو شارەکانی سنووری دەسەلاّتی خۆی تەرخان دەکرد و فەرمانی دەدا ئەم پارەیە بەقازی و گەورەکان بسپێرن تا ئەوانیش بەدەستی هەژاران و نیازمەندانی بگەیێنن.

بەئەندازەیەك هاوکاری بێکارەکانی دەکرد تا بتوانن کارێك دابین بکەن، هەرکات کاریان دەست دەکەوت، ئەوەی پێی دابوون، لێی وەردەگرتنەوە.

عێزد ئەلدەولە زانست و زانستخوازانی خۆش دەویست و ئەوانی لەخۆی نزیک دەکردەوە و ریزی لێ دەگرتن. لەناو کۆڕە و کۆبوونەوەکانیان دادەنیشت و گوێی لەپرسیار و وەڵامەکانیان دەگرت. زاناکان لەهەموو کەنارەکانەوە بۆ لای دەهاتن و چەندین کتێبیان بۆ نووسی. لەوانە: الایضاح لەنەحور، الحجە لە قرائت، الملکی لەپزیشکی، التاجی لەمێژوو ..... لەشوێنەکانی دیکە نەخۆشخانە و پردی دروست دەکرد تا هەمووان کەڵکی لێ ببینن بەڵام لەکۆتاییەکانی ژیانی، فەرمانێکی ستەمکارانەی سەبارەت بەماڵیاتی زەوی و چوارپێ و کاڵاکانی دیکەدا و ماڵیاتەکانی رابردووی زیاد کرد و رێگەی لەبەرهەم هێنانی سەهۆڵ و هەوریشم گرت و ئەم دوانەی کردەی کار و پیشەیەکی تایبەت. لەهەموو رێگەکانی بەردەمی، پارەی کۆدەکردەوە. کاتێك عێزەد ئەلدەولە مرد، رۆژی پێشتر نوێنەری ئەو باوکی رەبیانیان گرت ولەقۆلی کراسەکەی نامەیەکیان هێنایەدەر کەتیای نووسرابوو:

ایا واثقا بالدهر عندانصرافه رویدك انی بالزمان اخوخبر

و یا شامتا مهلا فکم ذی شماتة تکون له العقبی بقاصمة الظهر

واتاکەی: ئەی ئەو کەسەی لەکاتی مەرگ رۆژگارت بەبڕواپێکراو دەزانی، کەمێك چاوەڕوان بە چوونکە من رۆژگارم ئەزمون کرد، ئەی ئەو کەسەی زمان بۆ سەرکۆنە کردن دەکەیتەوە، کەمێك ئارام بە، ئەگەری هەیە سەرکۆنەکەرێك کەئەو دنیا بەپشت شکاندنی تایبەت بەو دەبێت.

## فەرمانڕەوای سەمسام ئەلدەولە لەعێراق، زاڵبوونی شەرەف ئەلدەولەی برای لەفارس

کاتێك عێزەد ئەلدەولە مرد، سەرکردەکان و فەرمانڕەکان لەگەڵ کوڕەکەی، کالیجاری مەرزوبان بەیعەتیان کرد و وەك فەرمانڕەوا هەڵیان بژارد و نازناوی سەمسام ئەلدەولەیان پێبەخشی. کاتێك لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت، بەدوو براکەی باوکی حسەین ئەحمەد و باوکی تاهیر فیروزشا خەڵاتی بەخشی و سنوری فارسی بەوان سپارد و فەرمانی پێدان بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێکەون تا لەگەیشتن بۆ شیراز پێش شەرەف ئەلدەولەی برایان کەون.

کاتێـك ئـەم دووانـە گەیـشتنە ئـەرجان، هـەواڵی ڕۆشـتنی شـەرف ئەلدەولـە بـۆ شیرازیان پێگەیشت، هەردووك بۆ ئەهواز گەڕانەوە. شەرف ئەلدەولە لـەکرمان بوو. کاتێك لەمـەرگی باوکی ئاگادار بوویـەوە، بەخێرایی بەرەو فارس ئەسپی غاردا و دەستی بەسەردا گرت و نەسر کوڕی هارونی نەسرانی، وەزیری باوکی قۆڵبەست کرد و کوشتی چوونکە لەکاتی فەرمانڕەوایەتی عێزەد ئەلدەولە بەردەوام دژایـەتی شـەرەف ئەلدەولـەی دەکـرد. شـەرەف ئەلدەولـە کاروبارەکـانی ئـەم سـەرزەمینەی ڕێکخست و سامانیدا. ئـەو، شـەریف بـاوکی حـسەین محەممـەد کـوڕی محەممـەد کوڕی عومەری عەلەوی و نەقیب باوکی ئەحمەدی موسەوی، باوکی شـەریفی ڕەزی و قـازی بـاوکی محەممـەد کـوڕی مـەعروف و بـاوکی نەسـر خواشـازەی لەزینـدان هێنایەدەر کەعێزەد ئەلدەوله زیندانی کردبوون و شۆڕش دژی سەمسام ئەلدەولەی برای ئاشـکرا کـرد و نـاوی ئـەوی لـەناو وتارەکانـدا نەخوێنـدەوە و بـەناوی خـۆی وتاری خوێندەوە و نازناوی تاج ئەلدەولەی بەخۆی بەخشی. سامانی بەخشی و سـەرباز و سـوپاییەکانی لـەدەوری خـۆی کـۆکردەوە و فەرمانڕەوایـەتی بەسـرەی گرتەدەست و بەباوکی حسەینی برای سپارد. ئەم بارودۆخە بۆ ماوەی سێ ساڵ درێژەی کێشا تا ئەوەی شەرەف ئەلدەوله- لەبەرچەندین هۆکار کەبەخواستی خوا ئاماژە پێدەدەین- ئەوی قۆڵبەست کرد.

کاتێك سەمسام ئەلدەوله لەکردەوەکانی براکەی ئاگادار بوویەوە، سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و ئەمیر باوکی حەسەن کوڕی دەبعەش، پـەردەداری عێزەد ئەلدەولـەی وەك فەرمانـدەی ئـەم سـوپایە دانـا. لـەولا تـاج ئەلدەولـە سـوپایەکی ڕازاندەوە و ئەمیر باوکی ئـەعێز دوبـەیس کـوڕی عـەفیفی ئەسـەدی وەك فەرمانـدەی سـوپاکەی دەستنیـشان کـرد. هـەردوو سـوپا لـەدەرەوەی قـەرقوب ڕووبـەڕووی یەکبوونـەوە و جـەنگ دەسـتی پێکـرد و دەرئـەنجام سـوپاکەی سەمـسام ئەلدەولـە شکستی خـوارد ودەبعـەش ئەسـیر کـرا. لـەم کاتـەدا بـاوکی حـسەین کـوڕی عێـزەد ئەلدەولـە دەسـتی بەسـەر ئـەهوازدا گـرت و هـەموو سـامانەکانی ئـەو شـارە و ڕامهورمـوزی تـاڵان کـرد و چـاوی تـەماحی بڕییـە فەرمانڕەوایـەتی. ئـەم ڕووداوە لەرەبیع الاوەلی٣٧٢ ئۆگۆستی ٩٨٣ زایینی ڕوویدا.

## کوژرانی حسەین کوڕی عیمران کوڕی شاهین

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی عیمران کوڕی شاهین، فەرمانڕەوای بوتەیحە کوژرا. باوکی فەرەجی برای ئەوی کوشت و فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی گرتەدەست.

چۆنیەتی کوژرانی ئەو بەم شێوە بوو: کاتێك باوکی فەرەج رژدی بەفەرمانڕەوایەتی براکەی و خۆشەویستی ئەو لای خەڵکان برد و بەرێکەوت خوشکەکەیان نەخۆش کەوت، باوکی فەرەج بەبراکەی وت: ئەگەر ئەو بگەڕێنیتەوە، باش دەبێتەوە. حسەین ئەو کارەی کرد و ڕۆشت تا ئەو بگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆیان. باوکی فەرەج چەند کەسێکی لەماڵەوە ئامادە کرد تا بۆ کوشتنی حسەین هاوکاری بکەن. کاتێك حسەین ڕۆشتە ناو ماڵەکە، هاوەڵانی لەدەرەوەی ماڵەکە مانەوە. باوکی فەرەج شمشێر بەدەست هاتە ناو. کاتێك دوو بەدوو لەگەڵ براکەی مانەوە، کوشتی. دەنگی هاواری بەرز بوویەوە و ئەو ڕۆشتە سەر بانی ماڵەکە و سوپاکەی لەکوشتنی براکەی ئاگادار کردەوە و بەڵێنی چاکەی پێدان و سوپا بێدەنگی هەڵبژارد. ئەو پارەی پێدان و ئەوان وەك فەرمانڕەوا پێی رازی بوون. ئەو نامەیەکی بۆ بەغداد نووسی و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی خەلیفە نیشاندا و داوای لێکرد تەوقی فەرمانڕەوایەتی بۆ هەڵواسێت. باوکی فەرەج پیاوێکی بوێر و نەزان بوو.

## گەڕانەوەی کوڕی سیمجور بۆ خوراسان

کاتێك باوکی حەسەن کوڕی سیمجور لەفەرماندەیی سوپای خوراسان دوور خرایەوە و باوکی عەباس وەك فەرماندە دەستنیشان کرا، کوڕی سیمجور ڕێگەی سیستانی گرتەبەر و لەوێ نیشتەجێ بوو. کاتێك باوکی عەباس- ئاماژەی پێدرا- لەجەنگی جورجان هەلاًت و ئاگری ئاژاوە بڵێسەی سەند، لەسیستانەوە ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و لەقوهستان مایەوە. کاتێك باوکی عەباس ڕۆشتە بوخارا و

خوراسانی بەجێهێشت، کوڕی سیمجور نامەی بۆ فائیق نووسی و بۆ زاڵبوون لەخوراسان داوای هاوکاری و خوازیاری بەستنی پەیمان بوو. فائیق رازی وهەردووك لەنەیشابور کۆبوونەوە و دەستیان بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت.

باوکی عەباس لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەبوخاراوە هێرشی کردە سەر مەرو. پەیکەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد و سەرئەنجام لەسەر ئەوە رێککەوتن نەیشابور و فەرماندەیی سوپا بۆ باوکی عەباس بێت و بەڵخ لەژێر فەرمانی فائیق و هەرات لەژێر دەستی باوکی عەلی کوڕی باوکی حەسەن کوڕی سیمجوردا بێت. بەبەستنی ئەم پەیمانە لێك جیابوونەوە و هەرکام بەرەو سنوری خۆی بەرێکەوت.

### بیرکردنەوەی چەند رووداوێك

لەم ساڵەدا نەقیبی نەقیبەکان باوکی تەمامی زەینەبی مرد و پێگەی نەقیبی دوای ئەو بەکوڕەکەی، باوکی حەسەن گەیشت. محەممەد کوڕی جەعفەر ناسراو بەزەوج ئەلحورە لەسەفەر/ جولای ئەم ساڵە لەبەغداد مرد. مەنسور کوڕی ئەحمەد کوڕی هارونی خۆپارێز لەتەمەنی شەست و پێنج ساڵی لەمانگی جومادی الاوەل/ ئۆکتۆبەر کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و سێی کۆچی( ٩٨٣و٩٨٤ زایینی )

## مەرگی مۆئەیید ئەلدەولە و گەڕانەوەی فەخر ئەلدەولە بۆ سنووری دەسەڵاتی خۆی

لەشەعبان/ ژانویەی ئەم ساڵە مۆئەییەد ئەلدەولە باوکی مەنسور بویە کوڕی ڕۆکن ئەلدەولە لەجورجان بەهۆی نەخۆشییەوە مرد. ساحەب کوڕی عیباد پێی وت: باشترە کەسێك وەك جێگری خۆت دەستنیشان بکەیت. مۆئەییەد ئەلدەولە پێی وت: بیری لێ دەکەمەوە، بەڵام کەسی هەڵنەبژارد و لەتەمەنی چل و سێ ساڵی مرد.

سەمسمام ئەلدەولە لەبەغداد پرسەی بۆ دانا و تائیع باللە بۆ دڵنەوایی کردنی ڕۆشتە لای و لەماڵەکەی سەردانی کرد. کاتێك مۆئەیید مرد، سەمسام ئەلدەولە لەگەڵ گەورەکانی وڵات سەبارەت بەجێنشینی ئەو راوێژی کرد. ساحەبی ئیسماعیل کوڕی عیباد پێشنیاری کرد فەخر ئەلدەولە بۆ سنووری دەسەڵاتی خۆی بگەڕێننەوە چوونکە ئەو گەورەی بنەماڵە و پێش مۆئەییەد ئەلدەولە ئەم سەرزەمینە لەژێر فەرمانی ئەودا بوو. سەمسام ئەلدەولە نامەیەکی بۆ فەخر ئەلدەولە نووسی کە لەو کاتەدا لەنەیشابور بوو، ساحەبی بۆ لای ئەو نارد تا کەسێك وەك جێگری خۆی هەڵبژێرێت. ئەو دەستبەجێ فیروز کوڕی ڕۆکن ئەلدەولەی هەڵبژارد بۆ ئەوەی تا گەیشتنی فەخر ئەلدەولە خەڵکان ئارام بگرن.

کاتێك فەخر ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە، ڕێگەی جورجانی گرتەبەر. کاتێك سوپاییەکان بینیان، ملکەچی خۆیان نیشاندا. ئەو لەمانگی رەمەزان/ فەوریە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. خواوەند هەرچی بخوازێت، جێبەجێ دەبێت.

کاتێك فەخر ئەلدەولە بۆ سنووری دەسەڵاتی خۆی گەڕایەوە، ساحەب پێی وت: سەروەرم! خواوەند تۆ بەمەبەست و منی بەئارەزووەکەی خۆم گەیاند. لەبەرابەر ئەو خزمەتەی کردوومە، داوا لەسەروەرم دەکەم لەکاروباری سوپایی دوور

بخرێمەوە و لەماڵەکەی خۆم خانەنشین بکرێم و سەرقاڵی پاڕانەوە و عیبادەتی پەروەردگار بم. فەخر ئەلدەولە وتی: ئەم قسە دووبارە مەکەرەوە چوونکە ئەگەر خوازیاری فەرمانڕەوایەتی بم لەگەڵ تۆدا دەمەوێت و بێ هاوکاری تۆ هیچم بۆ ناکرێت، ئەگەر ئەم کارە بەناخۆش دەزانی، منیش بەناخۆشی دەزانم و بۆ شوێنەکەی خۆم دەگەڕێمەوە. ساحەب سەری کوڕنوشی دانەواند و وتی: فەرمان، فەرمانی تۆیە. فەخر ئەلدەولە، ساحەبی وەك وەزیر دەستنیشان کرد و پێگەی بەرز کردەوە. لەهەموو کارە بچوك و گەورەکان راوێژی پێدەکرد.

خەلیفە چەندین خەڵات و دیاری بۆ فەخر ئەلدەولە نارد. فەخر ئەلدەولە، لەگەڵ سەمسام ئەلدەولە پەیمانیان بەست و بوونە هاودەنگ و هاوهەڵوێست.

## دوورخستنەوەی باوکی عەباس لەخوراسان و فەرمانڕەوای کوڕی سیمجور

کاتێك – ئاماژەمان پێدا– باوکی عەباس لەبوخارا بۆ نەیشابور گەڕایەوە، ئەمیر نوح، عەبدوللە کوڕی عوزەیزی وەك وەزیر هەڵبژارد. عەبدوللە لەگەڵ باوکی حسەینی عوتەبی و باوکی عەباس ناسازگار و کاتێك وەزارەتی گرتەدەست، باوکی عەباسی لەفەرماندەیی سوپای خوراسان دوور خستەوە و باوکی حەسەن کوڕی سیمجوری بۆ پێگەکەی گەڕاندەوە. سەرکردەکانی خوراسان نامەیەکیان بۆ عەبدوللە نووسی و داوایان لێکرد باوکی عەباس لەشوێنەکەی بهێڵێتەوە بەڵام عەبدوللە وەڵامی نەدانەوە. باوکی عەباس نامەیەکی بۆ فەخر ئەلدەولە کوڕی بویە نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. فەخر ئەلدەولە بەهێز و توێشووی فراوان هاوکاری کرد. ئەم سوپایە لەنەیشابور مایەوە و باوکی محەممەد عەبدوللە کوڕی عەبدرەزاق لەگەڵ ئەوان دژی کوڕی سیمجور کۆبوویەوە.

باوکی عەباس لەو کاتەدا لەمەرو بوو و کاتێك باوکی حەسەن کوڕی سیمجور و فائیق لەهاتنی سوپای فەخر ئەلدەولە بۆ نەیشابور ئاگادار بوونەوە، مەبەستی ئەوانیان کرد. سوپای فەخر ئەلدەولە و کوڕی عەبدرەزاق، خۆیان بەدوور گرت و چاوەڕوانی سوپای باوکی عەباسیان دەکرد. کوڕی سیمجور و هاوڕێکانیان لەدەرەوەی نەیشابور ئوردوویان لێدا تا ئەوەی باوکی عەباس و سوپاکەی گەیشتن

و پەیوەستی سوپای دەیلەمییەکان بوون. چەندین رۆژ لەنێوان ئەم دوو بەرە جەنگ روویدا. کوڕی سیمجور لەشارەکەدا سەنگەری گرت. فەخر ئەلدەولە سوپایەکی دیکەی بۆ هاوکاری باوکی عەباس نارد کەژمارەی سوارەکانی لەدوو هەزار تێپەڕی دەکرد. کوڕی سیمجور کاتێك هێزی باوکی عەباسی بینی، لەنەیشابور کشایەوە و شەوانە هەڵات. سوپای باوکی عەباس شوێنی کەوتن و بەشێکی زۆری چوارپێ و کاڵاکانی ئەوانیان تاڵان کرد. باوکی عەباس دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت و نامەی بۆ ئەمیر نوح نووسی و رێزی گرت. کوڕی عوزەیز بۆ دوورخستنەوەی باوکی عەباس پێداگری دەکرد و دایکی ئەمیر نوح، هاوهەڵوێستی کوڕی عوزەیز بوو. دایکی ئەمیر نوح لەکاروباری دەوڵەتی کوڕەکەی خۆی هەڵدەقورتاند و فەرمانەکانی ئەنجام دەدرا. یەکێك لەشاعیرەکانی ئەو رۆژگارە دەڵێت:

شیئان یعجز ذو الریاضته عنهما رأی النساء و امرة الصبیان

اما النساء فمیلهن الی الهوی و اخو الصبا یجری بغیر عنان

واتاکەی: دوو شتە کەسە بەتواناکان لەبەرابەری ناتەوانن: ئەندێشەی ژنان و فەرمانڕەوایی منداڵان. حەزی و تامەزرۆیی ژنان بۆ هەوا و هەوەسە و منداڵ بێ جڵەو بەم لاولادا دەڕوات.

## هەڵاتنی باوکی عەباس بۆ جورجان و مەرگی ئەو

کاتێك کوڕی سیمجور شکستی خوارد، باوکی عەباس لەنەیشابور مایەوە و بەردەوام دەیویست دڵی ئەمیر نوح و وەزیرەکەی بەدەست بێنێت و دوورخستنەوەی شوێنکەوتەکانی کوڕی سیمجوری لەخوراسان پشتگوێ خست. هاوەڵانی کوڕی سیمجور لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو دووبارە هێزی خۆی بەدەست هێنایەوە و هێزی هاوکاری لەبوخاراوە بۆ گەیشت. ئەو نامەیەکی بۆ شەرەف ئەلدەولە باوکی فوارس کوڕی عێزەد ئەلدەولە لەفارس نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. ئەو، هەرچەند مامی رازی نەبوو، بەدوو هەزار سوار هاوکاری کرد و کاتێك سوپاکەی کوڕی سیمجور فراوان بوو، مەبەستی رووبەرووی بوونەوەی باوکی عەباسی کرد. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و جەنگ تا کۆتایی رۆژ درێژەی

کێشا و سەرئەنجام باوکی عەباس و سوپاکەی شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر کران.

باوکی عەباس ڕێگەی جورجانی گرتەبەر کە لەژێر فەرمانی فەخر ئەلدەولەدا بوو. فەخر ئەلدەولە ڕێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد و جورجان، دەهێستان و ئێسترئابادی بەتەواوی بەخۆی و هاوەڵانی سپارد و خۆی ڕێگەی ڕەی گرتەبەر و لەوێوە بەرادەیەك توێشوو وهێزی بۆ باوکی عەباس نارد کەلەرادە بەدەرە.

باوکی عەباس و هاوەڵانی لەجورجان مابوونەوە. ئەو شەوانە سوپاکەی ئامادە و ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر بەڵام بێ ئەوەی بگاتە خوراسان بۆ جورجان گەڕایەوە و سێ ساڵ لەو شارە مایەوە. لەم کاتەدا کۆلێرا لەجورجان دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی ئەو مردن. سەرئەنجام خۆیشی پەیوەستیان بوو. مەرگی ئەو لەساڵی ٩٨٧/٣٧٧ زایینی بوو. دەستەیەك دەڵێن: ئەویان ژەهر خوارد کرد.

هاوەڵانی ئەو بەشێوەیەکی خراپ مامڵەیان لەگەڵ دانیشتووانی جورجان دەکرد و کاتێك باوکی عەباس مرد، دانیشتووانی شارەکە دژی هاوەڵانی ئەو ڕاپەڕین. جەنگێکی گەورە لەنێوان ئەوان ڕوویدا زۆر قورستر لەشکستی جورجانییەکان (شکستی باوکی عەباس لەبەرابەر کوڕی سیمجور). ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی باوکی عەباس لەخوێنی خۆیاندا گەوزان و ماڵەکانیان سووتێنرا و سامانەکانیان تالان کرا. پیرەکانیان داوای ئەمانیان کرد و جورجانییەکان دەستیان لەکوشتنی ئەوان هەڵگرت. سوپاکەی باوکی عەباس بلاوبوونەوە و زۆرینەی ئەوان ڕێگەی خوراسانیان گرتەبەر و پەیوەستی سوپاکەی باوکی عەلی کوڕی باوکی حەسەن کوڕی سیمجور بوون. ئەو لەو کاتەدا لەجیاتی باوکی – کەبەشێوەیەکی لەناکاو مردبوو– کاروباری سوپای بەڕێوە دەبرد. باوکی ئەو لەکاتی جووت بوون لەگەڵ خۆشەویستەکەی لەسەر سینەی ئەو مردبوو. کاتێك مرد، باوکی عەلی کوڕی جێگەی گرتەوە و براکانی ملکەچی فەرمانەکانی بوون. یەکێك لەبراکان باوکی قاسم بوو کەفائیق لەسەر فەرمانڕەوایەتی ئەو، ڕێگەی ناسازگاری گرتەبەر و بەخواستی خوا لەکاتی گێڕانەوەی فەرمانڕەوایی تورکی بوخاری لەساڵی ٩٩٣/٣٨٣ زایینی چەند و چۆنییەکەی باس دەکەین.

## کوژرانی باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عیمران و فەرمانڕەوایی باوکی ئەلمەعالی حەسەن کوڕی براکەی ئەو

لەم ساڵەدا باوکی فەرەج محەممەد کوڕی عیمران کوڕی شاهین، فەرمانڕەوای بوتەیحە کوژرا و باوکی ئەلمەعالی حەسەن، کوڕی براکەی ئەو، هاتە سەرکار.
چۆنیەتی کوژرانی ئەو بەم شێوە بوو: باوکی فەرەج ئەو دەستەی لەکوشتنی براکەی هاوکاریان کردبوو، پێشی خستن و ئەوانی وەك سوپاسالارەکانی خۆی دەستنیشان کرد. موزەفەر کوڕی عەلی پەردەدار کەگەورەترین سەرکردەی باوکی ئەو، عیمران و حەسەنی برای بوو، ئەم سوپاسالارانەی کۆکردەوە و لەدەرئەنجامی کارەکانیان ئەوانی ترساند. هەموویان بڕیاری کوشتنی باوکی فەرەجیاندا. موزەفەر ئەوی کوشت و باوکی ئەلمەعالییان هێنایە سەرکار و ئەو کاروبارەکەی بۆ بەڕێوەدەبرد. هەموو ئەو سەرکردانەی کوشت کەلێیان دەترسا و تەنیا سەرکردە بروا پێکراوەکانی هێشتەوە. باوکی ئەلمەعالی لەم کاتەدا هێشتا منالْ بوو.

## زاڵبوونی موزەفەر لەبوتەیحە

کاتێك فەرمانڕەوایەتی موزەفەر کوڕی عەلی پەردەدار لەبوتەیحە درێژەی کێشا و بەهێز بوو، تەماحی فەرمانڕەوایەتی بوتەیحەی لەسەردا پەروەردە کرد و بەفێڵ نامەیەکی لەزمانی سەمسام ئەلدەولە بۆ خۆی نووسی کەفەرمانڕەوایەتی بوتەیحەی بەخۆی دەسپارد. ئەم نامەیدا بەسوارێکی نەناسراو و فەرمانی پێدا کاتێك نامەکەی تەسلیم بکات کە لەناو سەرکردە و سوپاییەکاندایە. ئەو سوارە ئەو کارەی کرد و تەپ و تۆزاوی هاتە لای و نامەکەی تەسلیم کرد. موزەفەر نامەکەی ماچ کرد و کردییەوە و لەبەرابەر سەرکردەکانی سوپا خوێندییەوە و ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی نامەکە نیشاندا. باوکی ئەلمەعالی لەسەر کار لابرد و ئەوی خستە داوێنی دایکی و رۆژانەی بۆ هەردووکیان دیاریکرد. دواتر ئەوانی بۆ واست دوورخستەوە و رۆژانەی بۆ دەناردن و بێ راوێژ کردن بەکەسانی دیکە

کاوبارەکانی بەرێوە دەبرد. دادپەروەری لەناو خەڵکان بڵاو کردەوە و دادی بۆ خەڵکان گەڕاندەوە.

دواتر خوشکەزاکەی خۆی باوکی حەسەن عەلی کوڕی نەسری بەنازناوی موهەزیب ئەلدەولە کە لەو کاتەدا نازناوی ئەمیری موختاری بوو، و دوای ئەو خوشکەزاکەی دیکەی، باوکی حەسەن عەلی کوڕی جەعفەری وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. بەم شێوەیە بنەماڵەی عیمران کوڕی شاهین ناویان نەما. سوڕی جیهان بەردەوامە. ئەو هاوشێوەی بازکورد بوو کەپاشایەتی دەکرد و دوای خۆی خوشکەزاکەی مەمهەد ئەلدەولە کوڕی مەروانی وەك جێگر دەستنیشان کرد.

## سەرکێشی محەممەد کوڕی غانم

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی غانمی بەرزیکانی لەدیاری کوردور لەکەنارەکانی قوم دژی فەخر ئەلدەولە شۆڕشی کرد و دانەوێڵەی سوڵتانی تالآن و لەقەڵای حەفتجان پەنای گرت و بەرزیکانییەکانی لەدەروی خۆی کۆکردەوە. لەشەوال/ مارس سوپایەك بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرا بەڵام ئەو شکستی بەسوپاکە هێنا. سوپایەکی دیکە لەڕەی بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت بەڵام ئەم سوپایش ڕووبەرووی شکست بوویەوە.

فەخر ئەلدەولە نامەیەکی بۆ باوکی نەجم بەدر کوڕی حەسنەوییە نووسی و فەرمانی پێدان بارودۆخی نێوان ئەو و محەممەد کوڕی غانم سەقامیگر بکات. ئەو، ئەم کارەی کرد و نامەی بۆ کوڕی غانم نووسی و هەردووك لەسەرەتای ساڵی ٩٨٤/٣٧٤ زایینی پەیمانی ئاشتییان واژۆ کرد. ئەم بارودۆخە تا ساڵی ٩٨٥/٣٧٥ زایینی درێژەی کێشا تا ئەوەی سوپایەکی فەخر ئەلدەولە هێرشی کردەسەر محەممەد کوڕی غانم. کوڕی غانم ڕووبەڕوویان بوویەوە. لەکاتی جەنگەکە بریندار و ئەسیر کرا و سەرئەنجام بەهۆی برینەکەیەوە، مرد.

## گواستنەوەی دەستەیەك لەسەنهاجە لەئەفریقییەوە بۆ ئاندۆلۆس و وتەیەك سەبارەت بەکرداری ئەوان

لەم ساڵەدا مناڵەکانی زیری کوڕی مەناد، زاوی و جەلالە و ماکسن، براکانی بولکین، ڕۆشتنە ئاندۆلۆس.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: لەنێوان ئەوان و براکەیان حیماد، لەسەر فەرمانڕەوایەتی سەرزەمینەکانی ژێر دەستیان، جەنگ روویدا و حیماد سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەوان روویان کردە تەنجە ولەوێوە ڕێگەی قەرتوبەیان گرتەبەر. محەممەد کوڕی باوکی عامر ئەوانی لای خۆی هێشتەوە و شادمانی خۆی لەهاتنی ئەوان دەربڕی و دیاری پێشکەش کرد و لەهۆکاری هاتنەکەیان پرسیاری کرد. ئەوان و ئەویان لەبارودۆخی خۆیان ئاگادار کردەوە و وتیان: ئێمە تۆمان هەڵبژاردو حەز دەکەین شان بەشانی تۆ لەرێگەی خوادا بجەنگین. ئەم قسەی ئەوانی پەسەند کرد و بەڵێنی پێدان. ئەوان چەند رۆژێك لای ئەو مانەوە.

دواتر ڕۆشتنە لای کوڕی باوکی عامر و داوای جێبەجێ کردنی بەڵێنەکەیان لێکرد. وتی: بزانن چیتان لەسوپا دەوێت تا پێتانی ببەخشن. وتیان: کەس جگە لەئێمە و کوڕە مامەکان و سەنهاجییەکان، نەڕواتە سەرزەمینی دوژمن. کوڕی باوکی عامیر، ئەسپ و کەرەستەی جەنگ و سامانی پێدان و ڕێنیشاندەرێکی لەگەڵ ناردن. چوونکە ڕێگە تەنگ بوو، گەیشتنە سەرزەمینەی جەلیقییە و شەوانە ڕۆشتنە ئەو شارە و لەبێستانێکی نزیك شارەکە بۆسەیان نایەوە. هەرکەسیان لەوێ بینی کوشتیان و دارەکانیان بڕییەوە. لەبەرەبەیان، ژمارەیەك لەخەڵکانی شارەکە هاتنەدەر. ئەوانیشان گرت و کوشتیان و گەڕانەوە.

دوژمن لەکارەکانی ئەوان ئاگادار بوویەوە و شوێنپێی هەڵگرتن. کاتێك بینیان دەستەیەك شوێنیان کەوتوون، لەولای تەپۆڵکەیەك خۆیان شاردەوە. کاتێك دوژمن لای ئەوان گوزەری کرد، لەپشتەوە بەدەم وتنەوەی تەکبیر پەلاماریاندان. کاتێك دوژمن دەنگی تەکبیری ئەوانی بیست، گومانی کرد دەستەیەکی فراوانن و ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. سەنهاجییەکان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ

کوشتن. چوارپێ و کەرەستەکانی جەنگیان وەك تالانی کۆکردەوە و بۆ قەرتوبە گەڕانەوە. کارەکەی ئەوان لای کوڕی باوکی عامیر گەورە بوو، جەنگاوەری لەواندا بینی کە لەناو سوپاکەی ئاندۆلۆس کەم وێنە بوو. لەبەر ئەمە ڕێزی گرتن و ئەوانی لەخۆی نزیك کردەوە.

## هێرشی کوڕی باوکی عامر بۆ سەر فەرەنگەکان لەئاندۆلۆس

کاتێك ئاندۆلۆسییەکان لەکاری سەنهاجییەکان ئاگادار بوونەوە، ڕژدییان پێبردن و خوازیاری جیهاد بوون و بەمەنسور کوڕی باوکی عامریان وت: سەنهاجییەکان بۆ جەنگ ئێمەیان بزواند. ئەو لەکەنارەکانی دیکەوە سوپای کۆکردەوە و بۆ جیهاد بەرێکەوت. لەیەکێك لەشەوەکان لەخەودا بینی وەك بڵێی پیاوێك مارچوبەی (جۆرە ڕوەکێکە دەخورێت، ئەسفەراج) پێدا. ئەو مارچوبەی لەدەستی پیاوەکە وەرگرت و خواردی. کوڕی باوکی عامر خەوەکەی خۆی بۆ کوڕی باوکی جومعە گێڕایەوە. کوڕی باوکی جومعە پێی وت: بەرەو سەرزەمینی ئەلیون بەرێکەوە چوونکە دەستی بەسەردا دەگریت. کوڕی باوکی عامر پێی وت: چۆن ئەم لێکدانەوەت کرد و ئەم پێشنیارەم پێدەکەیت؟ کوڕی باوکی جومعە وتی: چوونکە مارچوبە لەرۆژهەڵاتی زەوی بەهلیون ناوی دەبرێت و فریشتەی خەو بەتۆی وتووە هالیون.

کوڕی باوکی عامر بەرەو ئەلیون بەرێکەوت و لەوێ دابەزی. ئەلیون یەکێك لەگەورەترین شاری فەرەنگییەکان بوو. ئەوان داوای هاوکارییان لەفەرەنگییەکان کرد و ئەوانیش سوپایەکیان بۆ هاوکاری دانیشتووانی شارەکە ڕەوانە کرد. دوو سوپا شەو و ڕۆژیان بەجەنگ بەسەر دەبرد و ژمارەیەکی زۆر کوژران. سەنهاجییەکان بوێرانە خۆڕاگرییان دەکرد. دواتر قومسی گەورە لەناو ڕۆمییەکان هاتەدەر و هێرشی کردە سەر ڕیزی سوپاییەکان و داوای ڕکەبەری کرد. جەلالە کوڕی زیری سەنهاجی بۆ جەنگی ئەو ڕۆشت و هەرکام هێرشی کردە سەر ئەوی دیکە. قومسی شمشێرێکی وەشاند بەڵام کوڕی زیری خۆی لادا و شمشێری لەملی ڕکەبەرەکەیدا و لەملی چەقی. قومس کەوتە سەرزەوی و موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر مەسیحییەکان و ئەوان بۆ سەرزەمینی خۆیان هەڵاتن و ژمارەیەکی

زۆریان لێ کوژرا. کوڕی باوکی عامر دەستی بەسەر ئەلیوندا گرت.

کوڕی باوکی عامر بەرادەیەك تالآنی کۆکردەوە کەهاوشێوەی نەبینراوە و نەبیستراوە. ئەو سی هەزار کەسی ئەسیر کرد و فەرمانیدا جەنازەی کوژراوەکان لەسەر یەك کەڵەکە بکەن. فەرمانی بەبانگبێژدا لەکاتی ئێواریێ، بانگیان بەسەردا بڵێت. ئەو شاری قامونەی وێران کرد و بێ زیان لەگەڵ سوپاکەی گەڕایەوە.

## مەرگی یوسفی بولیکن و فەرمانڕەوایەتی مەنسوری کوڕی

لەبیست و سێی زیحەججە/ بیست و هەشتی مەی ئەم ساڵە، یوسفی بولکین کوڕی زیری، فەرمانڕەوای ئەفریقییە لەوارقلین مرد.

هۆکاری ڕۆشتنی ئەو بۆ وارقلین ئەوە بوو خەزرونی زەناتی هێرشی کردە سەر سەجلماسە و نوێنەرەکەی لەو شارە دەرپەڕاندبوو و هەموو خواردەمەنی و توێشوی ئەو شارەی تالآن کردبوو. هەروەها زیری کوڕی عەتییەی زەناتی فەرمانڕەوایەتی فاسی گرتەدەست. یوسف بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوت و لەرێگەی گرفتاری نەخۆشی قوڵنج بوو. دەستەیەك وتیان: دومەڵێك لەدەستی هات و بەهۆیەوە مرد. مەنسوری کوڕی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد. مەنسور کە لەشاری ئەشیر دەژیا، پرسەی بۆ باوکی گێڕا. خەڵکانی قیروان و شارەکانی دیکە دەهاتنە لای و سەرەخۆشی مردنی باوکی و پیرۆزبایی فەرمانڕەوایەتییان لێدەکرد. ئەو ڕێزی لەخەڵکان گرت و پێی وتن: یوسفی باوکم و زیری باوەگەورێم بەشمشێر فەرمانڕەوایەتی خەڵکیان دەکرد بەڵام من تەنیا بەکردەوەی چاکە فەرمانڕەوایەتی ئێوە دەکەم. لەو کەسانە نیم بەدەستنووسێك بێتەسەر کار و بەدەستنووسێك لەسەر کار دووربخرێتەوە. مەبەستی لەم وتە ئەوە بوو خەلیفەی میسر ناتوانێت بەفەرمانێك ئەو دوور بخاتەوە.

دواتر بەرەو قیروان بەرێکەوت و لەرەوقادە نوردووی لێدا. کەنارەکانی ئەو شارەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و کارگوزار و فەرمانڕەواکانی دیاری کرد و خەلآتێکی گەورەی بۆ عەزیز باللە فەرمانڕەوای میسر نارد. دەستەیەك دەڵێن بەهای ئەم خەلآتە هەزار هەزار دینار بوو. دواتر بۆ ئەشیر گەڕایەوە و بۆ

کۆکردنــەوەی بــاجی قــیروان، مەهدییــە و هــەموو ئەفریقییــە، پیــاوێکی بــەناوی عەبدوللە کوڕی کاتب وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

## چۆنیەتی کارەکانی بازکورد، خاڵی منداڵەکانی مەروان و فەرمانڕەوایی ئەو لەموسڵ

لەم ساڵەدا پێگەی بازکورد بەرز بوویەوە. ناوی باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی دوستەك (دوسەك) ە و یەکێك لەسەرکردەکانی کوردە حەمیدییەکانە. ئەو لەسەرەتا لەکەنارەکانی دیاربەکر جەنگی زۆری ئەنجامدابوو. کەسێکی خاوەن شکۆ بوو. کاتێك عیزەد ئەلدەولە فەرمانڕەوایی موسڵی گرتەدەست، بازکورد ڕۆشتە لای بەڵام کاتێك عیزەد ئەلدەولە ئەوی بینی، لێی ترسا و بەخۆی وت: گومان ناکەم ئەو من لای خۆی بهێڵێتەوە و کاتێك لەبارەگاکەی ئەو هاتەدەر، هەڵات. عیزەد ئەلدەولە مەبەستی گرتنی ئەوی کرد و وتی: ئەو پیاوێکەی گەورەیە و خراپەکاری لەناخیدا شاراوەیە و نابێت کەسێکی وەك ئەو زیندوو بێت بەڵام پێیان وت بازکورد هەڵاتووە. عیزەد ئەلدەولە دەستی لەشوێنکەوتنی هەڵگرت.

بازکورد لەسنوورەکانی دیاربەکر، دەسکەوتی زۆری بەدەست هێنا و لەوێ مایەوە تا بەهێز و پێگەی بەرز بوویەوە و دەستی بەسەر مەیافارقیندا گرت. دوای مەرگی عیزەد ئەلدەولە بەشی زۆری دیاربەکری خستە ژێر فەرمانی خۆی. یەکێك لەهاوەڵانی خۆی گەیاندە نەسیبین و دەسەڵاتی ئەو شارەی گرتەدەست. سەمسام ئەلدەولە سوپایەکی بەفەرماندەیی باوکی سەعد بەهرام کوڕی ئەردەشێر رازاندەوە و ڕوبەڕووی بوویەوە. بەڵام بەهرام شکستی خوارد و ژمارەیەك لەهاوەڵانی ئەسیر کران و هێزی بازکورد زیادی کرد. سەمسام ئەلدەولە دووبارە سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی باوکی قاسم سەعد کوڕی محەممەدی پەردەدار بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. دوو سوپا لەباجولایا لەکەنار ڕووباری خابوری حوسەینییە لەشارەکانی کەواشی ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ژمارەیەکی زۆر لەم جەنگەدا کوژرا. ئەم جارەیش سەعد و سوپاکەی شکستیان خوارد و بازکورد ژمارەیەکی زۆر

لەدەیلەمییەکانی ئەسیر کرد، ژمارەیەکی زۆری کوشت و دواتر فەرمانی کوشتنی ئەسیرەکانیشی دەرکرد. باوکی حسەینی بەشنەوی لەمبارەوە دەڵێت:

بباجلایا جلونا عنه غمته        و نحن فی الروع جلاؤون للکرب

واتاکەی: لەباجولایا لەمۆتەکە و بەهێزییەکەی، لەکاتێکدا دەترساین، گوزەرمان کرد و بەڵای ئەو ناوچەمان لەپشت سەر بەجێهێشت. مەبەست لە(مۆتەکە) لەم هۆنراوەدا بازکوردە و بەخواستی خواوەند چەند و چۆنیەتییەکەی لەساڵی ١٠٤٠/٤٣٢ زایینی باس دەکەین.

کاتێک بازکورد شکستی بەدەیلەمییەکان و سەعد هێنا و ئەو بەڵای بەسەردا هێنا کەئامارژەمان پێدا، سەعد دەستپێشخەری کرد و ڕۆشتە ناو موسڵ. بازکورد شوێنپێی هەڵگرت. لەم کاتەدا خەڵکی شارەکە لەبەر خراپەکاری دەیلەمییەکان دژی سەعد و سوپاکەی شۆڕشیان کرد بەڵام ئەو توانی خۆی رزگار بکات. بازکورد ڕۆشتە ناو موسڵ و فەرمانڕەوایەتی شارەکەی گرتەدەست و پێگەی بەرز بوویەوە. بازکورد بیری لەگرتنی بەغداد و دوورخستنەوەی دەیلەمییەکان لەو شارە کردەوە. لەلایەن فەرمانڕەوای بەغداد و خەلیفە ناوی خرایە پێرستی ئاژاوەگێڕان. سەمسام ئەلدەولە لێی دەترسا و کارەکانی بازکورد ئەوی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد. سوپای ئامادە کرد تا بۆ جەنگی بازکورد بەرێکەوێت بەڵام ساڵ کۆتایی پێهات.

یەکێک لەهاورێیانی کوردی حەمیدی ئێمە کەسەرقاڵی نووسینەوەی کار و مێژووی بازکوردە، پێی وتم نازناوی بازکورد، باوکی شوجاعە و ناوی ئەو بازە. و باوکی عەبدوللە کەهەمان حسەین کوڕی دۆستەکە، برازای بازە. بازە سەرەتا شوان و مەڕەی دەلەوەڕاند. ئەو پیاوێکی بەخشندە و دەستبڵاو بووە. مەڕێکی بۆ میوانداری کردنی خەڵکان سەردەبڕی. بەبەخشندەیی ناوی دەرکرد و خەڵک لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو ڕێگەکانی دەبڕی و ئەوەی بەدەستی دەهێنا، لەناو خەڵکانی هەژار و نەدار دەیبەخشییەوە. شوێنکەوتەکانی زیادیان کرد و جەنگی بەهاوکاری ئەوان دەست پێکرد. دواتر ڕووی کردە ئەرمەنستان و شاری ئەرجیشی خستە ژێر فەرمانی خۆی. ئەمە یەکەم شار بوو باز دەستی بەسەردا گرت و بەهۆیەوە بەهێز بوو. لەوێوە هێرشی کردەسەر دیاربەکر و ڕۆشتە شاری

ئامەد و مەیافارقین وشارەکانی دیاربەکری گرت و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و وەك ئاماژەمان پێدا، فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەیشی گرتەدەست.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا عەزیز باللە، خەلیفەی عەلەوی، بەکجوری تورك، موالی قەرغویە، یەکێك لەکۆیلەکانی سەیف ئەلدەولە کوڕی حەمدانی وەك فەرمانڕەوای دیمەشق و کەنارەکانی دیاریکرد. ئەو پێشتر فەرمانڕەوای حیمس بوو. لەوێوە ڕێگەی دیمەشقی گرتەبەر و ستەمکاری کردە پیشە و بەشێوەیەکی خراپ هەڵس وکەوتی لەگەڵ دانیشتووانی دیمەشق دەکرد. گێڕانەوەکانی تایبەت بەم باسەمان لەفراوانی لەساڵی ٩٨٢/٣٧٢ زایینی باس کردووە.

لەم ساڵەدا باوکی محەممەد عەلی کوڕی عەباس کوڕی فوسانجس وەك وەزیری شەرەف ئەلدەولە دەستنیشان کرا.

لەرەبیع الاوەل/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی گەورە (نەیزەك) کەوتەخوار و سەراسەری جیهانی بەنووری خۆی ڕووناك کردەوە و هەمان سات دەنگێکی مەترسیدار بەگوێ گەیشت.

لەم ساڵەدا نرخی کاڵاکان لەعێراق و سەرزەمینەکانی دەوروبەر بەرز بوویەوە و خواردەمەنی کەمی کرد. ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەبرسا مردن.

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی سەعدان، وەك وەزیری سەمسام ئەلدەولە دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا قەرەمتییەکان لەبەغداد نزیك بوونەوە و لەکاتی مەرگی عێزەد ئەلدەولە چاوی تەماحیان بڕییە ئەو سەرزەمینە بەڵام بەوەرگرتنی پارە ڕازی بوون و ڕێگەی گەڕانەوەیان گرتەبەر.

لەجومادی الاخرە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە سەعید کوڕی سەلام باوکی عوسمانی مەغربی لەنەیشابور کۆچی دوایی کرد. ئەو لەقیروان چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەشام نیشتەجێ بوو. ئەو لەگەڵ مامۆستایانی وەك باوکی خەیری ئەقتەع و کەسانی دیکە هاونشین بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و چواری کۆچی ( ٩٨٤و٩٨٥ زایینی )

### گەڕانەوەی دەیلەمییەکان بۆ موسڵ و شکستی بازکورد

کاتێك بازکورد دەستی بەسەر موسڵدا گرت، سەمسام ئەلدەولە و وەزیرەکەی، کوڕی سەعدان، بیریان لەلەناو بردنی ئەو دەکردەوە و سەرئەنجام بڕیاریاندا زیار کوڕی شەهراکویە کەیەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی ئەوان بوو، بۆ جەنگی بازکورد ڕەوانە بکەن. سەمسام فەرمانی پێدا بۆ جەنگی بازکورد بەرێکەوێت. سەمسام سوپای بۆ ڕازاندەوە و لەدابین کردنی نیازەکانی زێدەڕۆیی کرد و سەرباز و توێشوو و سامانی فراوانی خستە بەردەست. زیار بۆ جەنگی بازکورد بەرێکەوت. باز و سوپاکەی هاتنە گۆڕەپانی جەنگ و لەسەفەر/ جولای ئەم ساڵە دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. ئەم جەنگە بەشکستی سوپاکەی بازکورد کۆتایی پێهات و ژمارەیەك لەکەسان و سەربازەکانی ئەسیر کران. ئەسیرەکانیان بردە بەغداد و دەیلەمییەکان دەستیان بەسەر موسڵدا گرت.

زیاد سوپایەکی بەفەرماندەیی سەعدی پەردەدار بۆ شوێنپێ هەڵگرتنی بازکورد ڕەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە دوورگەی کوڕی عومەر. ئەو سوپایەکی دیکەی بۆ نەسیبین نارد و ئەم سوپایە سەبارەت بەهەڵبژاردنی فەرماندە ناسازگار بوون و بۆ پێشڕەوی کردن و ڕووبەڕووی بوونەوەی سوپای بازکورد گوێڕایەڵی فەرمانی فەرماندەکەیان نەبوون. بازکورد لەدیاربەکر خەڵکانێکی زۆری کۆکردەوە. وەزیری سەمسام، نامەیەکی بۆ سەعد ئەلدەولە کوڕی سەیف ئەلدەولە نووسی و دیاربەکری بەو سپارد. ئەو سوپایەکی بۆ ئەو شارە ڕەوانە کرد بەڵام ئەم سوپایە نەیتوانی لەبەرابەر سوپاکەی بازکورد خۆڕاگری بکات و بۆ حەلەب گەڕایەوە. سوپاکەی بازکورد گەمارۆیان خستبووە سەر مەیافارقین. سەعد کاتێك سوپای بازکوردی لەوێ بینی، بۆ کوشتنی بازکورد بیری لەفرت و فێڵ کردەوە و پیاوێکی بۆ کوشتنی ئەو ڕاسپارد.[٧]

---

[٧]- ئەو چەکەی هەمیشە فەرمانڕەواکان دژی فەرمانڕەوا کوردەکان بەکاریان بردووە و گرفتاری شەڕی دووبەرەکی و شەڕی نێوخۆیان کردوون و بەم شێوەیە هێز و توانای ئەوانیان لاواز کردووە. لێرەدا دەردەکەوێت سوپای خەلیفە

ئەم پیاوە شەوانە ڕۆشتە خێوەتەکەی بازکورد و شمشێری لێدا. ئەو گومانی کرد شمشێرەکە بەرسەری بازکورد کەوتووە بەڵام شمشێرەکە بەرقاچی کەوت. بازکورد هاواری بەرز بوویەوە و ئەو پیاوە هەڵات. باز کورد بەهۆی ئەم گورزەوە زەوی گیر بوو. ژمارەیەکی زۆری کوردەکان لەدەوری کۆببوونەوە. ئەو نامەی بۆ زیار و سەعد نووسی و خوازیاری ئاشتی بوو. بارودۆخی نێوان ئەوان بەم پێیە سەقامگیر بوو کەدیاربەکر و بەشێکی توری عەبدین لەژێر فەرمانی بازکورد بێت. زیار ڕێگەی بەغدادی گرتەبەر و سەعد لەموسڵ مایەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا باوکی تەریف عولیان کوڕی سەمالی خەفاجی وەك سەرپەرەستی قەڵاکانی کوفە دەستنیشان کرا. ئەمە یەکەم فەرمانڕەوایەتی منالەکانی سەمالە.

لەم ساڵەدا باوکی حسەین کوڕی عێزەد ئەلدەولە لەئەهواز بەناوی فەخر ئەلدەولە وتاری خوێندەوە، بەهەمان شێوە باوکی تاهیر کوڕی عێزەد ئەلدەولە لەبەسرە بەناوی ئەو وتاری خوێندەوە و هەردووك بەناوی فەخر ئەلدەولە سکەیان لێدا.

لەم ساڵەدا لەعەممان بەناوی سەمسام ئەلدەولە وتار خوێندرایەوە. پێشتر بەناوی شەرەف ئەلدەولە وتاریان دەخوێندەوە. نوێنەری شەرەف ئەلدەولە لەعەممان ئوستاد هورموز بوو کەپەیوەستی سەمسام ئەلدەولە بوو. کاتێك شەرەف ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بویەوە، سوپایەکی بۆ ئەو سەرزەمینە ڕەوانە کرد، ئوستاد هورموز شکستی خوارد و ئەسیر کرا و عەممان گەڕایەوە ژێر فەرمانی شەرەف ئەلدەولە. ئوستاد هورموز لەیەکێك لەقەڵاکان زیندانی کرا و داوای سامانێکی زۆریان لێدەکرد.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی کامە، سەرکردەی سوپای ڕۆکن ئەلدەولە مرد.

لەم ساڵەدا شەرەف ئەلدەولە، باوکی مەنسور کوڕی ساڵحانی ئازاد و وەك

---

و دەوڵەت توانای ڕووبەڕووی بوونەوەی سوپای کوردانی نەبووە و بۆیە بەبەکار هێنانی فرت و فێڵ، بیریان لەلەناو بردنی هێزی ئەوان کردۆتەوە، ئەو بەلای لەمێژە کوردەکان پێوەی دەناڵێنن. وەرگێر.

وەزیری خۆی دەستنیشانی کرد. وەزیرەکەی، باوکی محەممەد کوڕی فەسانجسی قۆڵبەست و زیندانی کرد.

لەم ساڵەدا شەرەف ئەلدەولە پەیکی بۆ لای قەرەمتییەکان نارد. کاتێك پەیك گەڕایەوە، وتی: قەرەمتییەکان پرسیاری فەرمانڕەوایان لێکردم و من لەکردەوە جوانەکانی فەرمانڕەوا دوام. وتیان: ئەوە چۆن فەرمانڕەواییێکە بێ هیچ بنەمایەك لەساڵێکدا سێ وەزیر دەگۆڕێت؟ دوای ئەوە شەرەف ئەلدەولە، وەزیرەکەی، باوکی مەنسور کوڕی ساڵحانی لەپێگەکەی هێشتەوە.

لەم ساڵەدا باوکی فەتح محەممەد کوڕی حسەینی ئەزدی موسڵی، حافزی بەناوبانگی قورئان مرد. دەستەیەك ساڵی مردنی ئەو بە٩٧٩/٣٦٩ زاییینی دەزانن. حەدیسەکانی ئەو بەلاواز هەژمار دەکرێت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و پێنجی کۆچی( ٩٨٥و٩٨٦ زایینی )

## ئاژاوەی بەغداد

لەم ساڵەدا لەناو دەیلەمییەکانی بەغداد ئاژاوە سەریهەڵدا. چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو ئەسفار کەردویە، کەیەکێك لەگەورەترین سوپاسالارەکان بوو، پشتی کردە سەمسام ئەلدەولە و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی بۆ پەیوەست بوون بەشەرەف ئەلدەولە هاندا. هەموویان لەسەر ئەم ڕێککەوتن تا ئەمیر بەها ئەلدەولە کوڕی عێزەد ئەلدەولە وەك جێگری براکەی، شەرەف ئەلدەولە، وەك فەرمانڕەوای بەغداد دەستنیشان بکەن.

لەم کاتەدا سەمسام ئەلدەولە نەخۆش بوو و ئەسفار توانی ئەندێشەکانی خۆی ئاشکرا بکات. ئەو نەدەڕۆشتە بارەگای سەمسام ئەلدەولە. سەمسام نامەی بۆ نووسی و ڕێزی گرت و ئارامی کردەوە بەڵام ئەم کارەی بووە هۆی بوێری سەمسام ئەلدەولە بۆ دروست کردنی ئاژاوە. سەمسام ئەلدەولە کاتێك ئەم بارودۆخەی بینی، نامەی بۆ خەلیفە تائیع نووسی و داوای لێکرد هاوهەڵوێستی بۆچوون وبڕیارەکانی بێت. لەم کاتەدا سەمسام ئەلدەولە لەنەخۆشییەکەی ڕزگاری ببوو. تائیع بەپێشنیارەکەی ڕازی نەبوو. سەمسام ئەلدەولە ڕێزی لەفولاندی زەماندار گرت. ئەویش پەیوەستی ئەسفار ببوو بەڵام لەبەر پێگەی بەرزی خۆی، حەزی بەهاوڕێیەتی ئەو نەدەکرد. کاتێك سەمسام نامەی بۆ نووسی، فولاد وەڵامی دایەوە و سەمسام ئەلدەولە سوێندیدا. فولاد ڕۆشتەدەر و جەنگی لەگەڵ ئەسفار دەست پێکرد. ئەسفار شکستی خوارد و ئەمیر باوکی نەسر، ئەوی زیندانی کرد. ئەویان بردە لای سەمسام ئەلدەولە. سەمسام ئەلدەولە بەزەیی پیایدا هاتەوە و زانی تاوانی نییە. لەبەر ئەمە بەو پەڕی ڕێز گرتن ئازادی کرد. لەم کاتەدا باوکی نەسر تەمەنی پانزە ساڵ بوو.

بارودۆخ بۆ سەمسام ئەلدەولە سەقامگیر بوو. لای ئەو، خراپەی وەزیرەکەی، کوڕی سەعدانیان هێنایە سەرزمان و ئەوی لەسەر کار لابرد. دەوترا کوڕی سەعدان ویستوویەتی هاوکاری ئاژاوەگێرەکان بکات. خوێنیان ڕشت. ئەسفار بۆ ئەهواز گەڕایەوە و پەیوەستی ئەمیر باوکی حسەین کوڕی عێزەد ئەلدەولە بوو و خزمەتی ئەوی دەکرد. سوپاییەکانی دیکە پەیوەستی شەرەف ئەلدەولە بوون.

## بەسەرهاتی قەرەمتییەکان

لەم ساڵەدا ئیسحاق و جەعفەری بەحریان، دووان لەو شەش قەرەمتییەی نازناوی ساداتیان هەڵگرتبوو، ڕۆشتنە کوفە و دەستیان بەسەردا گرت و بەناوی شەرەف ئەلدەولە وتاریان خوێندەوە. خەڵك لەزۆرداری و ستەمکاری ئەوان بێزار بوون. بەرادەیەك زۆردار بوون کەعێزەد ئەلدەولە و بەختیار بەناچاری زەوی زۆری خستبووە بەردەستیان.

جێگری ئەوان لەبەغداد بەئەبوبەکر کوڕی شاهویە ناوی دەبرا کەهاوشێوەی وەزیرێك فەرمانی دەدا. سەمسام ئەلدەولە ئەوی گرت. کاتێك ئەم دووانە ڕۆشتنە کوفە، سەمسام ئەلدەولە نامەیەکی بۆ نووسین و ڕێزی گرتن و لەهۆکاری هاتنی ئەوانی پرسی. ئەو دوانە گیرانی جێگرەکەی خۆیان بەهۆکاری هاتنی خۆیان لەقەڵەمدا. ئەم دووانە هاوەڵانی خۆیان بڵاو و باجیان کۆکردەوە.

لەم ناوەدا باوکی قەیس حسەین کوڕی مونزەر، یەکێك لەگەورەکانی ئەوان، گەیشتە جامعەین. سەمسام ئەلدەولە سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد. عەرەبەکان لەناو ئەم سوپایەدا دەبینران. ئەوان لەفورات گوزەریان کرد و ڕووبەڕووی بوونەوە. ئەو هەڵات و ژمارەیەك لەسوپاکەی ئەسیر کران و کوژران. قەرەمتییەکان گەڕانەوە و سوپایەکی گەورە و بەهێزیان ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە لەجامعەین ڕووبەڕووی سوپاکەی سەمسام ئەلدەولە بوویەوە و ئەم جارەیش قەرەمتییەکان شکستیان خوارد و فەرماندەکەیان و ژمارەیەکی دیکەیان کوژران و دەستەیەکیان ئەسیر و ئاوەدانییەکانیان تالان کرا. کاتێك هەڵاتووان گەیشتنە کوفە، قەرەمتییەکان ئەو شارەیان بەجێهێشت. سوپای سەمسام ئەلدەولە تا قادسیە شوێنیان کەوت بەڵام نەیانتوانی بیانگرن. چیتر خەڵکان لەزۆرداری قەرەمتییەکان ئاسوودە بوون.

## ئازادی وەردی ڕۆمی و دەرئەنجامی کاری ئەو و باوەڕهێنانی ڕوسەکان بەمەسیحییەت

لەم ساڵەدا سەمسام ئەلدەولە، وەردی ڕۆمی ئازاد کرد. پێشتر ئاماژەمان بەچۆنیەتی زیندانی کرانی ئەودا. لەم کاتەدا لەزیندان هێنایانەدەر و ئازادیان کرد و پەیمانیان لەگەڵ بەست بۆ ئەوەی ژمارەیەك لەموسوڵمانە ئەسیرەکان ئازاد بکات و

حەوت شاری رۆم و گوندەکانی بەموسوڵمانان بسپێرێت و ئەوەی تا دوا ساتەکانی ژیانی نەخۆی و نەهیچ کام لەهاوەڵانی هێرش نەکەنە سەر سەرزەمینە ئیسلامییەکان. سەمسام ئەلدەولە توێشوو و هێزی پێویستی پێدا و ئەو رێگەی رۆمی گرتەبەر. لەرێگە چاکەی لەگەڵ سارانشین و کەسانی دیکە کرد و تەماحی کۆکردنەوەی تالانی خستە بەردەمیان تا گەیشتە مەلَتییە و دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت و بەپارە و سامانی ئەم شارە خۆی بەهێز کرد.

دواتر وەرد مەبەستی لەناوبردنی وەردیس کوڕی لاونی کرد. لەنێوان ئەو دووانە نامەکان ئاڵوگۆڕ کران و بەوە کۆتایی هات کەقوستەنتەنییە وکەنارەکانی باکور لەکەنداو لەژێر فەرمانی وەردیس بێت و بەشەکەی دیکەی لەژێر فەرمانی وەرد. ئەو دوانە لەسەر ئەم بڕیارە رێککەوتن و پەیمانیان بەست. وەردیس، وەردی گرت و زیندانی کرد بەڵام بەخێرایی لەکارەکەی پەشیمان بوویەوە و لەزیندان هێنایەدەر. وەردیس لەکەنداو گوزەری کرد و گەمارۆی خستە سەر قوستەنتەنییە. ئەم شارە لەژێر فەرمانی بەسیل و قوستەنتین دوو کوڕەکەی ئەرمانوسدا بوو. بارودۆخی لەم شارە دژوار کرد. ئەم دووانە نامەیان بۆ پاشای روسەکان نووسی و داوای هاوکارییان لێکرد و خوشکەکەی خۆیان کردە هاوسەری ئەو بەڵام خوشکەکەیان رازی نەبوو ببێتە هاوسەری کەسێك کەئایینەکەیان جیاوازە. پاشای روس باوەڕی بەمەسیحییەت هینا. ئەو یەکەم کەس لەروسەکان بوو باوەڕی بەم ئایینە هێنا و خوشکی بەسیل و قوستەنتینی کردە هاوسەری خۆی و بۆ رووبەروو بوونەوەی وەردیس بەرێکەوت. جەنگ لەنێوان دوو سوپا دەستی پێکرد و وەردیس کوژرا. دوو پاشا لەسنووری خۆیان مانەوە و نامەیەکیان بۆ وەرد نووسی و سنوورەکانی ژێر فەرمانی ئەویان وەك خۆی هێشتەوە. وەرد دوای ئەم رووداوە ماوەیەك ژیا و دواتر مرد. دەڵێن: ژەهر خواردیان کرد.

بەسیل لەبەرێوەبردنی وڵات بەردەوام پێشکەوتنی تازەی بەدەست دەهێنا. ئەو پیاوێکی دادپەروەر، بوێر و چاکەکار بوو. پاشایەتی ئەو چەندین ساڵ درێژەی کێشا و بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ دژی بولغارەکان جەنگی و سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بەشێکی زۆری بولغارەکانی لەسەرزەمینەکەیان گواستەوە و لەرۆم نیشتەجێی کردن. ئەو رێزی لەموسوڵمانان دەگرت.

## فەرمانڕەوایی شەرەف ئەلدەولە لەئەهواز

لەم ساڵەدا شەرەف ئەلدەولە باوکی فوارس کوڕی عیزەد ئەلدەولە لەفارسەوە بەمەبەستی گرتنی ئەهواز بەرێکەوت و پەیکی بۆ لای براکەی، باوکی حسەین، نارد و رەزامەندی ئەوی بەدەست هێنا و بەڵێنی پێدا سنوورەکانی ژێر فەرمانی بەو بسپێرێت. ئەو بەبراکەی وت مەبەستی گرتنی عێراقی لەسەردایە و دەخوازێت براکەی، ئەمیر باوکی نەسر، لەزیندان ئازاد بکات. باوکی حسەین گرنگی بەوتەکانی نەدا وبڕیاریدا رێگەی لێ بگرێت و لەبەر ئەمە سوپای رازاندەوە. ئاگادار بوویەوە شەرەف ئەلدەولە گەیشتۆتە ئەرجان و بەرەو رامهورموز بەرێکەوتووە. سەربازەکانی باوکی حسەین کاتێک ئەم هەواڵەیان بیست، پەیوەستی سوپاکەی شەرەف ئەلدەولە بوون و بەناوی شەرەف ئەلدەولە دروشمیان بەرز کردەوە. باوکی حسەین هەڵات و رێگەی ڕەی گرتەبەر تا پەیوەستی فەخر ئەلدەولەی مامی بێت. گەیشتە ئیسفەهان و لەوێ مایەوە و داوای هاوکاری لەمامی کرد. مامی بڕێك پارەی بۆ نارد و بەڵێنی هاوکاری پێدا.

کاتێك ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا، مەبەستی زاڵبوون وگرتنی ئیسفەهانی کرد و دروشمی شەرەف ئەلدەولەی برای بەرز کردەوە. سوپای ئیسفەهان هێرشیان کردە سەر و گرتیان و ڕەوانەی بارەگای مامیان لەشاری ڕەی کرد. ئەو زیندانی کرا. باوکی حسەین لەزیندان مایەوە تا فەخر ئەلدەولەی مامی نەخۆش کەوت و کاتێك نەخۆشییەکەی تەنگی پێهەڵچنی، کەسی نارد بۆ ئەوەی باوکی حسەین بکوژێت. باوکی حسەین هۆنراوەی دەهۆنییەوە. ئەم یەکێك لەهۆنراوەکانیەتی:

| | |
|---|---|
| هب الدهر ارضانی و اعتب صرفه | و اعقب بالحسنی و فك من الأسر |
| فمن لی بایام الشباب التی مضت | و من لی بما قد فات فی الحبس من عمری |

واتاکەی: گریمان زەمانە منی شادمان کرد و بەردەوام چاکەی بەسەرمندا باراند و چاکەکاری پێبەخشیم و لەبەند رزگارم بوو، چی لەرۆژگاری گەنجیەتیم بکەم و رۆژەکانی ژیانم کە لەزیندان بەسەر چوو، لەکوێ بەدوایدا بگەڕێم.

شەرەف ئەلدەولە رێگەی ئەهوازی گرتەبەر و دەستی بەسەردا گرت و کەسی بۆ

بەسرە نارد و فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەیشی گرتەدەست و براکەی، باوکی تاهیری گرت. سەمسام ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و سازی ئاشتی بۆ شەرەف ئەلدەولە ژەنی و دەرئەنجامەکەی بەمە کۆتایی هات: لەعێراق پێش سەمسام ئەلدەولە بەناوی شەرەف ئەلدەولە وتار بخوێنرێتەوە و سەمسام ئەلدەولە جێگری ئەو بێت و براکەی شەرەف ئەلدەولە، ئەمیر بەها ئەلدەولە باوکی نەسر، لەزیندان ئازاد بکات. سەمسام ئەلدەولە، ئەمیری ئازاد و ڕەوانەی شەرەف ئەلدەولەی کرد. بارودۆخ سەقامگیر و ئارامی باڵی بەسەر وڵات کێشا.

سەرکردەکانی سوپای شەرەف ئەلدەولە لەبەر گەڕانەوە بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان خوازیاری ئاشتی بوون. لەعێراق بەناوی شەرەف ئەلدەولە وتار دەخوێندرایەوە و بەردەوام لەلایەن خەلیفە تائیعەوە خەڵات و دیاری بۆ ڕەوانە دەکرا تا ئەوەی نێردراوانی تائیع بۆ لای گەڕانەوە تا بۆ خەلافەت سوێندی بدەن و هەموو شارەکانی وەك واست و شوێنەکانی دیکە بەو بسپێرن و سەرکردەکان ملکەچی خۆیان نیشان بدەن. ئەو لەپەیمانی ئاشتی پەشیمان بوویەوە و بیری لەگرتنی بەغداد کردەوە. سوێندی بۆ براکەیشی نەخوارد.

شەریف باوکی حەسەن محەممەد کوڕی عومەر هاوڕێی شەرەف ئەلدەولە بووو. ئەو شەرەف ئەلدەولەی هاندا و پێشنیاری پێکرد هێرش بکاتە سەر بەغداد و بۆ گرتنی عێراق تەماحی خستە بەردەم. شەرەف ئەلدەولە بەپێشنیارەکەی ڕازی بوو. پاشماوەی ئەم گێڕانەوەیە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٩٨٦/٣٧٦ زایینی باس دەکەین.

## چۆنیەتی شکستی سوپاکەی مەنسور لەفەرمانڕەوای سەجلماسە

پێشتر ئاماژەمان بەسەرکەوتنی خەزرون و زیری زەناتی لەسەجلماسە و فاسدا و وتمان یوسفی بولکین لەکاتی هێرش کردنە سەر ئەو دوانە مرد. کاتێك یوسف مرد، ئەو دوانە توانیان دەست بەسەر ئەو دیارەدا بگرن و کاتێك مەنسور هاتە سەرکار، سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەم دووانە ڕەوانە کرد تا بەفەرمانبەری ناچاریان بکەن. کاتێك ئەم سوپایە لەفاس نزیك کەوتەوە، فەرمانڕەواکەی زیری

کوڕی عەتییەی زەناتی، ناسراو بەقرتاس، لەگەڵ سەربازەکانی ڕووبەڕوویان بوونەوە و شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان ڕوویدا. دەرئەنجام سوپاکەی مەنسور شکستی خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران و ئەسیر کران. بەم شێوەیە فەرمانڕەوایەتی زیری و پێگەی بەهێز و بەرز بوویەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەعەممان لەدەریا، باڵندەیەکی گەورە هاتەدەر، گەورەتر لەفیل و لەسەر تەپۆڵکەیەك وەستا و بەدەنگی بەرز و زمانێکی پاراو وتی: نزیك بوویەوە، نزیك بوویەوە، نزیك، دواتر بۆ ناو ئاوەکە گەڕایەوە. ئەو سێ ڕۆژ ئەم کارەی دووبارە کردەوە و چیتر کەس ئەوی نەبینی.

لەم ساڵەدا سەمسام ئەلدەولە لەبەغداد،ماڵیاتی فرۆشی جل و بەرگی هەوریشمی و پەمووی کەدەیەك بەهاکەی بوو، سەر لەنوێ دارشتەوە. بۆ ئەم مەبەستە خەڵك لەمزگەوتی مەنسور کۆبوونەوە و بڕیاریاندا نوێژی جەماعەت نەخوێنن. ئەوەندەی نەمابوو ئاژاوە لەشارەکە سەر هەڵبدات کەماڵیاتەکەیان لەسەر شانی خەڵکان لابرد.

لەم ساڵەدا کوڕی مۆئەییەد ئەلدەولە کوڕی بویە مرد. سەمسام ئەلدەولە پرسەی بۆ گێڕا و تالیع بۆ سەرەخۆشی هاتە لای.

لەم ساڵەدا باوکی عەلی کوڕی حسەین کوڕی باوکی هورەیرە، فەقیهی ناوداری شافعی، و باوکی قاسم عەزیز کوڕی عەبدوڵلەی دارکی، پێشەوای شافعییەکانی عێراق، هەردووك مردن. باوکی قاسم لەمانگی شەوال/ فەوریە و لەتەمەنی حەفتا و چەند ساڵی مرد. ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەبدوڵلە کوڕی محەممەد کوڕی ساڵح، فەقیهی مالکی، مرد. ئەو لەساڵی ٩٠٠/٢٨٧ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. داوایان لێکرد ببێتە قازی قازییەکانی موسوڵمانان بەڵام ڕازی نەبوو. وەلید کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی وەلید باوکی عەباسی زەوزەنی سۆفی حەدیسبێژ لەم ساڵەدا مرد. ئەو چەندین نووسراوی لەخۆی بەجێهێشتووە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و شەشی کۆچی ( ٩٨٦و٩٨٧ زایینی )

## زاڵبوونی شەرەف ئەلدەولە لەعێراق و گرتنی سەمسام ئەلدەولە

لەم ساڵەدا شەرەف ئەلدەولە باوکی فوارس کوڕی عێزەد ئەلدەولە لەئەهوازەوە هێرشی کردە سەر واست و دەستی بەسەردا گرت. سەمسام ئەلدەولە براکەی ئەوی بۆ دڵنەوایی کردن و ئارام کردنەوەی شەرەف ئەلدەولە ئازاد کرد بەڵام ئەو ئارام نەبوویەوە و کەڵێنی نێوان ئەو دووانە فراوانتر بوو. لەلایەکی دیکە سەربازەکانی سەمسام ئەلدەولە دژی ئەو شۆڕشیان کرد.

سەمسام ئەلدەولە راوێژی لەگەڵ کەسە نزیکەکانی کرد تا بڕواتە لای براکەی و ملکەچی خۆی نیشان بدات بەڵام هاوڕێکانی رێگەی ئەو کارەیان لێگرت. یەك لەوان وتی: باشتروایە رێگەی عوکبرا بگرینەبەر بۆ ئەوەی بزانین کێ لەگەڵمانە و کێ دژمان، ئەگەر زانیمان هێز و توێشووی پێویستمان لەبەردەستایە، رووبەروویان دەبینەوە و تالآنیان دەکەین و ئەگەر خۆمان بەناتەوان بینی، رێگەی موسڵ دەگرینەبەر چوونکە موسڵ و شارەکانی چیا لەگەڵ ئێمەن و بەم شێوەیە بەهێز دەبین و لەنێوان تورك و دەیلەمییەکان رژدی بردن و ئێرەیی کردن و پەرێشانی سەرهەڵدەدات و ئێمە بەمەبەستی خۆمان دەگەین.

یەکی دیکە وتی: بۆچوونی پەسەند ئەوەیە رێگەی قەرمیسین بگرینەبەر و تۆ نامەیەك بۆ فەخر ئەلدەولەی مامت بنووسی و داوای هاوکاری لێ بکەیت و لەرێگەی خوراسان و ئیسفەهانەوە بەرەو فارس بڕۆیت و دەستی بەسەردا بگریت و گەنجینەکانی شەرەف ئەلدەولە تالآن بکەیت چوونکە هێزی بەرگریکار لەوێ بوونی نییە. ئەگەر ئەو کارە بکەین شەرەف ئەلدەولە ناتوانێت لەعێراق بمێنێتەوە و بەئاشتی رازی دەبێت.

سەمسام ئەلدەولە هیچ کام لەم بۆچوونانەی پەسەند نەکرد و لەگەڵ بەلەمێکی تونـدڕەو لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی بۆ لای براکەی، شەرەف ئەلدەولە بەرێکەوت و ڕۆشتە بارەگای براکەی و چاوی پێی کەوت و رەزامەندی ئەوی

بەدەست هێنا بەلاّم کاتێك هاتەدەر، شەرەف ئەلدەولە ئەوی گرت و کەسانێکی ڕەوانەی بەغداد کرد تا ڕێگەی لەتالاّن کردنی کۆشکی فەرمانڕەوایەتی بگرن. ئەو خۆی لەرەمەزان/ ژانویە ڕۆشتە بەغداد و لەنزیك مالّی شەفیعی نیشتەجێ بوو. سەمسام ئەلدەولە، برای لەتەنیشت ئەو زیندانی کرابوو. فەرمانڕەوایی شەرەف ئەلدەولە لەعێراق سێ سالّ و پانزە مانگ درێژەی کێشا.

## ئاژاوە لەنێوان تورکەکان و دەیلەمییەکان

لەم سالّەدا لەنێوان تورکەکان و دەیلەمییەکانی هاورێی شەرەف ئەلدەولە لەبەغداد ئاژاوە کەوتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ژمارەیەك لەدەیلەمییەکان کەژمارەیان دەگەیشتە پانزە هەزار کەس، لای شەرەف ئەلدەولە کۆبوونەوە. ژمارەی تورکەکان سێ هەزار کەس بوو. دەیلەمییەکان دەستدرێژیان کردە سەر تورکەکان و لەنێوان چەند کەس لەوان و تورکەکان لەسەر مالّ و تەویلەیەك دەمەبۆلّە ڕوویدا و بەجەنگ کۆتایی هات. دەیلەمییەکان چوونکە پشتیان بەژمارەی فراوانی خۆیان دەبەست، ویستیان سەر لەنوێ سەمسام ئەلدەولە بۆ سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی بگەڕێننەوە.

شەرەف ئەلدەولە لەم هەوالّە ئاگادار بوویەوە. کەسی بۆ چاودێری کردنی سەمسام ئەلدەولە راسپارد تا ئەگەر دەیلەمییەکان مەبەستی ئازاد کردنی بکەن، بیکوژێت. دەیلەمییەکان کاتێك بەسەر تورکەکاندا سەرکەوتن، شوێنیان کەوتن و بەم شێوەیە بلاّو بوونەوە. تورکەکان لەپێش و دواوە هێرشیان کردنەسەر. دەیلەمییەکان شکستیان خوارد و زیاتر لەسێ هەزار کەسیان کوژرا. تورکەکان ڕۆشتنە ناو شارەکە و هەرکەسێکی دەیلەمییان دەبینی، دەیانکوشت و سامانەکانیان تالاّن کرد. دەیلەمییەکان پەرێشان پەنایان بۆ شەرەف ئەلدەولە برد و دەستەیەکیان هەلاّتن.

بەیانی ئەو ڕۆژە شەرەف ئەلدەولە هاتە بەغداد و ئەو دەیلەمییانەی پەنایان بۆ بردبوو، هاورێیەتیان دەکرد. خەلیفە تائیع پیشوازی لێکرد. شەرەف ئەلدەولە سەری کوڕنوشی دانەواند. دەیلەمییەکان بیری سەمسام ئەلدەولەیان کردەوە.

بەشـەرەف ئەلدەولـە وتـرا: ئەگـەر نـەیکوژێت، دووبـارە فەرمانڕەوایـەتی بـەو دەسپێرن.

شەرەف ئەلدەولە لەنێوان تورك و دەیلەمییەکان ئاشتی سەقامگیر کرد و ئەوانی سوێندا و سەمسام ئەلدەولـەی بۆ فارس نارد و لـەوێ لەقەلاّیـەك زینـدانی کـرد. شەرەف ئەلدەولە، زەوییەکانی شەریف محەممەد کوڕی عومەری گەڕاندەوە و پێی زیاد کرد. باجی ساڵانەی زەوییەکانی ئەو دوو هەزار هەزار و پێنسەد هەزار درهـەم بـوو. هـەروەها زەوییـەکانی نـەقیب بـاوکی ئەحمـەدی موسـەوی بـۆ گەڕانـدەوە و هەرکام لەخەڵکانی لەپێگەیەك جێگیر کرد و ڕێگە لەدووزمانی و بوختان هەڵبەستن گرت و نەیدەهێشت کەس خراپەی کەسـی دیکە بێنێتـە سـەرزمان. هـەموان ئارام و هێـور بوونـەوە. بـاوکی مەنسور کـوڕی سـاڵحانی وەك وەزیـری خـۆی دەستنیشان کرد.

## فەرمانڕەوای موهەزیب ئەلدەولە لەبوتە یحە

لـەم ساڵەدا موزەفـەر کـوڕی عـەلی مـرد و خوشـکەزاکەی بـاوکی حەسـەن عـەلی کـوڕی نەسـر کـەوەك جێگـر دەستنیـشانی کردبـوو، جێگـەی ئـەوی گرتـەوە. ئـەو نامەیەکی بۆ شـەرەف ئەلدەولـە نووسی و ملکەچی و گوێڕایـەڵی خـۆی نیشاندا و داوای لێکـرد فەرمانڕەوایەتییەکـەی پـشتراست بکاتـەوە. شـەرەف ئەلدەولـە ڕازی بـوو. بـاوی حەسـەن نازنـاوی موهـەزیب ئەلدەولـەی پێبڕا و کردارێکـی پەسـەندی گرتەبەر و چاکەی لەگەڵ هەموان کرد. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە.

بوتەیحـە بـوو بەسـەنگەرێك بـۆ هەرکەسـێك کەپـەنای بـۆ دەبـرد. گـەورەکان بوتەیحەیان کردە شوێنی مانەوەی خۆیان و چەندین ماڵ و کۆشکی جوانیـان تیا دروسـت کـرد. چـاکەکاری ئـەو بەهـەموان دەگەیـشت. فـەرمانڕەواکانی دەوروبـەر نامـەیان بۆ دەنووسـی و وەڵامیان دەدرایەوە. بەها ئەلدەولـە کچەکەی خـۆی کردە هاوسـەری ئـەو. پێگـەی تـا ئەوجێگەیـە بـەرز بوویـەوە کـەقاهر بـالله پـەنای بۆ بـرد. موهەزیب بالله پشتیوانی کرد و قادر بالله لای ئـەو مایـەوە – بەخواسـتی خواوەنـد ئاماژەی پێدەدەین– تا خەلافەتی گرتەدەست.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا باوکی حسەین عەبدولرەحمان کوڕی عومەری سۆق، ئەستێرەناسی عێزەد ئەلدەولە، مرد. ئەو لەڕەی و لەساڵی ٩٠٣/٢٩١ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا ئەردهەژێنێکی گەورە موسڵی لەرانەدوە و بەشێکی زۆری ماڵەکان وێران و ژمارەیەکی زۆر لەژێر داروپەردوودا مردن.

لەم ساڵەدا مەنسور کوڕی یوسف، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، عەبدوڵڵەی کاتبی کوشت و یوسف کوڕی باوکی ئەحمەدی لەجێگەی ئەو دانا. ئەو پێشتر والی قەفەسە بوو.

لەم ساڵەدا لەبەغداد گرانێکی ئەوتۆ هاتە ئاراوە کەزۆرینەی بەغدادییەکان شارەکەیان بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی بەهلولی تەنوخی ئەزرەقی ئەنباری کاتب، مرد.

لەم ساڵەدا ئەحمەد کوڕی حسەین کوڕی عەلی باوکی حامیدی مەروزی، ناسراو بەکوڕی تەبەری، فەقیهی حەنەفی کەفیقە لەباوکی حەسەنی کەرخی لەبەغداد فێر ببوو و قازی قازییەکانی خوراسان بوو، لەمانگی سەفەر/ جون مرد. ئەو پیاوێکی خۆپارێزی حەدیسبێژ بوو. حەدیسەکان بڕواپێکراوە.

لەم ساڵەدا ئیسحاق کوڕی موقتەدر باللە باوکی محەممەد، باوکی قادر، مرد. ئەو لەساڵی ٩٢٩/٣١٧ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. کوڕی قادر کە لەو کاتەدا فەرمانڕەوا بوو، لەسەر جەنازەکەی ئەو نوێژی خوێند.

لەم ساڵەدا باوکی عەلی حەسەن کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبد غەفاری فارسی نەحوی، نووسەری کتێبی (ایضاح) کەساڵەکانی تەمەنی لەنەوەد گوزەری کردبوو، مرد. دەڵێن یەکێك لەشوێنکەوتەکانی موعتەزیلە بوو.

لەم ساڵەدا باوکی ئەحمەد محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی حسەین کوڕی غەتریفی جورجانی لەمانگی ڕەجەب/ نۆڤەمبەر مرد. وتەکانی ئەو لەحەدیس بڕواپێکراوە و بەڵگەی زۆری هێناوەتەوە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و حەوتی کۆچی( ٩٨٧و٩٨٨ زایینی )

## جەنگی نێوان بەدر کوڕی حەسنەوییە و سوپاکەی شەرەف ئەلدەولە

لەم ساڵەدا شەرەف ئەلدەولە سوپایەکی گەورەی بەفەرمانـدەیی قەراتکینی جەهشیاری ڕازاندەوە.

قەراتکین سەرکردە و گەورە سوپاسالاری سوپاکەی بوو. فەرمانی پێدان بۆ جەنگ لەگەڵ بەدر کوڕی حەسنەوییە بەرێکەون.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: شەرەف ئەلدەولە ڕقی بەدری لەدڵ گرتبوو چوونکە ئەو زیاتر خوازیاری پەیوەست بوون بەفەخر ئەلدەولە بوو. کاتێك بارودۆخی شەرەف ئەلدەوله لەبەغداد سەقامگیر و خەڵکانی ملکەچی فەرمانەکانی بوون، مەبەستی لەناو بردنی بەدری کرد. قەراتکین لەسەختگیری و ڕیسوا کردنی خەڵکان بۆ پشتیوانی کردن لەنوێنەرەکانی شەرەف ئەلدەولە – کەخۆی یەکێك لەوان بوو– زێدەڕۆیی کرد و شەرەف ئەلدەوله بەباشی زانی، بەم بیانووە قەراتکین لەبەغداد دوور بخاتەوە. ئەگەر قەراتکین سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، ئاگری تووڕەیی شەرەف ئەلدەولە دادەمرکایەوە و ئەگەر بەدر سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، لەشەڕ و بەڵای قەراتکین ئاسوودە دەبوو.

سوپا هێرشی کردە سەر بەدر. بەدریش سوپای ڕازاندەوە و هێزی کۆکردەوە. هەردوو سوپا لەدۆڵی قەرمیسین ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و لەکۆتاییدا، بەدر شکستی خوارد و خۆی لەقەراتکین شاردەوە. قەراتکین و سوپاکەی گومانیان کرد بەدر ڕێگەی خۆی گرتۆتەبەر. لەئەسپەکان دابەزین و لەخێوەتەکانی خۆیان بڵاو بوونەوە. هێشتا کاژێرێك تێپەڕی نەکرد کەبەدر جارێکی دیکە هێرشی برد و پەلاماریدان تا ئەو جێگەی دەرفەتی سوار بوونی ئەسپەکانی پێنەدان. ژمارەیەکی زۆری لەسوپاکەی قەراتکین کوشت و لەشکرگاکەی تاڵان کرد. قەراتکین و چەند کەس لەگەنجەکان ڕزگاریان بوو. قەراتکین کاتێك گەیشتە پردی نەهرەوان، مایەوە تا هەڵاتووان پەیوەستی بوون. ئەو لەگەڵ ئەوان ڕۆشتە ناو بەغداد و بەدر دەستی بەسەر کەنارەکانی چیاکان و بەشی سەرەوەی ئەو سەرزەمینەدا گرت و پێگەی بەرز بوویەوە.

قەراتکین کاتێك لەم شکستە گەڕایەوە، دوورکەوتنەوەی لەدەربار، زیادی کرد و لەبەر ئەمە سوپاییەکانی بۆ ئاژاوە و هێرش کردنە سەر باوکی مەنسور کوڕی ساڵحان هاندا. ئەوان بەشێوەیەکی ناپەسەند چاویان بەوەزیر کەوت بەڵام وەزیر بەنەرمی وەڵامی دانەوە و توانی ئەوان دوور بخاتەوە. شەرەف ئەلدەولە، قەراتکین و وەزیری ئاشت کردەوە و ڕێگەی فرت و فێڵی دژی قەراتکین گرتەبەر. چەند ڕۆژ دواتر ئەوی لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی گرت و سامانەکانی زەوت کردن. سوپاییەکان بۆ بەرگری کردن لەو شۆڕشیان کرد. شەرەف ئەلدەولە، قەراتکینی کوشت و سوپاییەکان ئارام بوونەوە. شەرەف ئەلدەولە، توغانی پەردەداری کردە سەرکردەی ئەوان و هەموان ملکەچی فەرمانەکانی بوون.

## ڕەوانە بوونی مەنسور کوڕی یوسف بۆ جەنگ لەگەڵ کەتامە

لەم ساڵەدا مەنسور، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و بۆ جەنگ لەگەڵ کەتامە، ڕێگەی ئەو دیارەی گرتەبەر.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: عەزیز باڵلە ی عەلەوی بەنوێنەرایەتی خۆی، بانگەشەکەرێکی بەنازناوی باوکی فەهم وناوی حەسەن کوڕی نەسر، بۆ کەتامە ڕەوانە کرد. ئەو حەسەنی بۆ ئەو دیارە نارد تا خەڵکان بۆ ملکەچ بوون و فەرانبەری هان بدات. مەبەستی لەم کارە ئەوە بوو خەڵکانی کەتامە پەیوەستی بن و ئەو سوپایەك ڕەوانە بکات تا دژی مەنسور بجەنگن و لەئەفریقییە دووری بکەنەوە چوونکە مەنسور لەوێ سوپایەکی کۆکردبوویەوە. کاتێك باوکی فەهم گەیشتە کەتامە، پێشنیاری فەرمانبەری کردنی خەڵکانی بەعەزیز باڵلە کرد. شوێنکەوتەکانی باوکی فەهم فراوان بوون و پێگەی بەرز بوویەوە. مەنسور بڕیاریدا هێرشی بکاتەسەر. مەنسور پەیکی بۆ لای عەزیز باڵلە نارد و لەم بارودۆخە ئاگاداری کردەوە. عەزیز باڵلە دوو نوێنەری بۆ لای ئەو نارد و ڕێگەی توند و تیژی لەگەڵ باوکی فەهم و خەڵکانی کەتامەی لێگرت. عەزیز باڵلە فەرمانی بەم دوو نوێنەرەدا دوای گەیاندنی پەیامەکە بەمەنسور، ڕێگەی کەتامە بگرنەبەر.

کاتێك دوو نێردراو گەیشتنە لای مەنسور و پەیامەکەی عەزیز باڵلە یان پێڕاگەیاند، مەنسور جوێنی بەو دوانە و عەزیز باڵلە دا. ئەو دوانەیش بەشێوەیەکی توند لەگەڵ

مەنسور قسەیان کرد و مەنسور فەرمانیدا ئەو دوانە مانگی شەعبان و رەمەزان/ نۆڤەمبەر و دێسامبەر لای ئەو بمێننەوە و مۆڵەتی پێنەدان بەرەو کەتامە بڕۆن و خۆی بۆ جەنگی کەتامە و باوکی فەهم ئامادە کرد و دوای جەژنی رەمەزان، مەبەستی میلەی کرد و بڕیاریدا خەڵکەکەی کوشتار و ژن و منداڵەکانی ئەسیر بکات بەڵام خەڵکان ڕۆشتنە لای و قوڕ قوڕ گریان و فرمێسکیان لەچاو باراند. مەنسور لێیان خۆش بوو و دیواری شارەکەی وێران کرد و لەگەڵ دوو نوێنەرەکەی عەزیز باللە بەرەو کەتامە بەرێکەوت.

ئەو لەرێگە دەگەیشتە هەرکۆشك و ماڵێك، وێرانی دەکرد تا ئەوەی گەیشتە شاری سەتیف. ئەم شارە پایتەختی رێزداری خەڵکانی کەتامە بوو. خەڵکانی ئەم شارە جەنگێکی بوێرانەیان ئەنجامدا و دەرئەنجام، خەڵکانی کەتامە شکستیان خوارد و باوکی فەهم بۆ کوێستانێکی دژوار هەڵات کەخەڵکانی کەتامە لەوێ نیشتەجێ ببوون و بەمناڵەکانی ئیبراهیم ناو دەبران. مەنسور پەیکی بەدوای ئەواندا نارد و ترساندنی و داوای کرد باوکی فەهم تەسلیم بکەن. ئەوان وەڵامیان دایەوە: باوکی فەهم میوانی ئێمەیە و ئێمە تەسلیمی ناکەین بەڵام ئەگەر خۆت کەسێك بنێریت، بۆ ئەوەی قۆلبەستی بکات، رێگەی لێ ناگرین. مەنسور دەستەیەکی نارد و ئەوی گرت. دواتر ئەشکەنجەی کرد و کوشتی و پێستی هەڵکەند. سەنهاجییەکان و کۆیلەکان لەگۆشتی ئەویان خوارد. لەگەڵ ئەو ژمارەیەك لەبانگەشەکەران و گەورەکانی کەتامە کوژران. مەنسور بۆ ئەشیر گەڕایەوە و دوو نێردراوەکەی بۆ لای عەزیز باللە گەڕاندەوە. ئەم دوانە عەزیز باللە یان لەبەسەرهاتی مەنسور و باوکی فەهم ئاگادار کردەوە و وتیان: لای ئەو وحشیانەوە دێین کەمرۆڤ دەخۆن. عەزیز نوێنەرێکی دیکەی بۆ لای مەنسور نارد و رێزی گرت. خەڵاتی بۆ کرد بەڵام ناوی باوکی فەهمی نەبرد.

## گەڕانەوە بۆ جەنگ

لەم ساڵەدا تەماحی بازکورد بۆ دەست بەسەردا گرتنی سەرزەمینەکانی موسڵ و دەوروبەری، دووبارە سەری هەڵدایەوە.

هۆکارەکەی ئەوە بوو: کاتێك سەعدی پەردەدار لەموسڵ مرد، شەرەف ئەلدەولە، باوکی نەسر خواشازەی بۆ موسڵ ڕەوانە کرد و سوپایەکی بۆ رازاندەوە. خواشازە نامەیەکی بۆ شەرەف ئەلدەولە نووسی و داوای هێز و توێشووی لێکرد و لەبەر ئەوەی

هێز و توێشوو، درەنگ بەدەستی گەیشت، ئەو زەوییەکانی ئەو دیارەی بەعەرەبەکانی منداڵەکانی عوقەیلدا تا ڕێگە لەهێرشی بازکورد بگرن. بازکورد هات و دەستی بەسەر توری عەبدیندا گرت بەڵام نەیتوانی خۆی بگەیێنێتە دەشت و براکەی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کرد و ئەو ڕووبەڕووی عەرەبەکان بوویەوە. براکەی بازکورد، لەم جەنگەدا کوژرا و سوپاکەی هەڵات و سەربازەکان بەجەنگی یەکترەوە سەرقاڵ بوون.

لەم ناوەدا هەواڵی مەرگی شەرەف ئەلدەولە گەیشت. خواشازە بۆ موسڵ گەڕایەوە و هەموانی لەمەرگی شەرەف ئەلدەولە ئاگادار کردەوە. عەرەبە دەشتەکییەکان بەهەمان شێوە ڕێگەیان لەهاتنی بازکورد بۆ دەشت دەگرت و بازکورد لەکوێستانەکان مابوویەوە. خواشازە کاروبارەکانی خۆی ڕێکدەخست بۆ ئەوەی دووبارە لەگەڵ بازکورد بجەنگێت کەئیبراهیم و باوکی حسەین، کوڕەکانی ناسر ئەلدەولە، هاتنە لای و چەند و چۆنییەکەی بەخواستی خواوەند باس دەکەین.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا خەلیفە تائیع خوانێکی گشتی ڕێکخست و گەورەکانی وڵات هاتنە بارەگاکەی. ئەو خەڵاتی بەشەرەف ئەلدەولە بەخشی و هەردووك سوێندی وەفادارییان بۆ یەك خوارد.

لەرەجەب/ ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە ئەمیر باوکی عەلی حەسەن کوڕی فەخر ئەلدەولە مرد.

لەم ساڵەدا ساحەب کوڕی عیباد ڕۆشتە تەبەرستان و بارودۆخی ئەو ناوچەی ڕێکخست و زاڵبووان بەسەر ئەو سەرزەمینەی دەرپەڕاند و دەستی بەسەر چەندین قەڵادا گرت کەقەڵای قەریم یەك لەوان بوو. ئەو لەهەمان ساڵ گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا ئەمیر باوکی مەنسور کوڕی کوریکەنج، فەرمانڕەوای قەزوێن، دژی فەرخ ئەلدەولە ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. فەخر ئەلدەولە بەنەرمی هەڵس وکەوتی لەگەڵ کرد و ئەمانی پێبەخشی و ڕێزی گرت. باوکی مەنسور جارێکی دیکە ملکەچی فەرمانەکانی بوو. لەرەمەزان/ دێسامبەری ئەم ساڵە لەنێوان دەیلەمییەکان و خەڵکی موسڵ ئاژاوە ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر کوژران. دواتر ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر بوو.

لەم ساڵەدا تا نیوەی کانونی دووەم باران نەباری و لەعێراق و سەرزەمینەکانی دەوروبەر گرانی هاتە ئاراوە. خەڵکان دووجار بۆ باران، نوێژە بارانەیان خوێند بەڵام باران نەباری. سەرئەنجام لەحەفدەی کانونی دووەم باران باری و بی هیوایی لەناوچوو. دواتر بارینی باران بەردەوام بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و هەشتی کۆچی( ٩٨٨ و ٩٨٩ زایینی )

### قۆڵبەست کردنی شوکری خزمەتکار

لەم ساڵەدا شەرەف ئەلدەولە، شوکری خزمەتکاری قۆڵبەست کرد. شوکر یەکێك لەنزیکترین کەسەکانی باوکی، عێزەد ئەلدەولە بوو کەگوێی لەوتەکانی ئەو دەگرت و بەکەسێکی بڕواپێکراوی دەزانی.

هۆکاری قۆڵبەست کرانی ئەوە بوو ئەو لەرۆژگاری عێزەد ئەلدەولە، دەڕۆشتە لای و دەیرەنجاند و ئەو بووە هۆی ئەوەی شەرەف ئەلدەولە لەبەغداد بۆ کرمان دوور بخرێتەوە. هەروەها کاری سەمسام ئەلدەولە لەئەستۆی شوکردا بوو و لەبەر ئەمە شەرەف ئەلدەولە، ڕقی ئەوی لەدڵ گرت. کاتێك شەرەف ئەلدەولە هاتە سەرکار، شوکر خۆی شاردەوە. شەرەف ئەلدەولە بۆ دۆزینەوەی ئەو هەوڵی زۆریدا بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

شوکر کەنیزێکی حەبەشی بوو کەئەوی کردبووە هاوسەری خۆی. ئەو ماوەیەك خزمەتی شوکری دەکرد. ئەم کەنیزە حەزی لەکەسێکی دیکە دەکرد و و خواردن و هەرچی بویستایە، لەکۆشکی شوکر دەبردە هەر شوێنێك کەدەیخواست. شوکر لەم پەیوەندییەی ئەو ئاگادار بوویەوە و نەیتوانی پێی رازی بێت و لێیدا. کەنیز توڕە، ڕۆشتە بارەگای شەرەف ئەلدەولە و لەجێگەی شوکر ئاگاداری کردەوە. شوکریان گرت و بردیانە لای شەرەف ئەلدەولە. شەرەف ئەلدەولە مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەڵام نەحریری خزمەتکار نێوەنجیگەری کرد وشەرەف ئەلدەولە ئەوی بەنەحریر بەخشی. دواتر شوکر داوای مۆڵەتی ڕۆشتن بۆ ماڵی خوای لێکرد وشەرەف ئەلدەولە مۆڵەتی پێدا. ئەو سەرەتا ڕۆشتە مەککە و دواتر ڕێگەی میسری گرتەبەر و لەوێ پێگەی بەرز بوویەوە و بەخواستی خواوەند، دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

### دوورخستنەوەی بەکجور لەفەرمانڕەوایەتی دیمەشق

لەم ساڵەدا بەکجور لەفەرمانڕەوایەتی دیمەشق دوورخرایەوە.

هۆکاری دوورخستنەوەکە ئەوە بوو ئەو لەدیمەشق خراپەکاری دەکرد و کردەوە نەشیاوەکانی ئەنجام دەدا. یەعقوب کوڕی کلسی وەزیر خۆی لەو دوور دەخستەوە

و گومانی لەبەکجور دەکرد. جیاواز لەوەی ئەو بەلای -ئامازەمان پێدا- بەسەر هاوەلانی ئەودا هێنا کەباسمان کرد. کاتێك هەوالی کردەوەکانی ئەو لەگەل خەلکانی دیمەشق بەیەعقوبی وەزیر گەیشت، بۆ دوورخستنەوەی ئەو هەولیدا و لای عەزیز باللە خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان. عەزیز باللە بەوتەکانی رازی و سوپایەکی لەمیسرەوە بەفەرماندەیی مونیری خزمەتکار رەوانەی شام کرد.

بەکجور، عەرەبە دەشتەکییەکان و کەسانی دیکەی کۆکردەوە و رووی کردە گۆڕەپانی جەنگ. ئاگری جەنگ بلێسەی سەند و بەکجور و سوپاکەی شکستیان خوارد. بەکجور لەهاتنی نەزال، فەرمانڕەوای تەرابلوس نیگەران بوو چوونکە لەمیسرەوە نامەیان بۆ نووسیبوو هاوکاری مونیر بکات. کاتێك بەکجور شکستی خوارد، ترسا لەوەی نەزال بگات و قۆلبەستی بکات. بەکجور، پەیکی بۆ لای دوژمن نارد و داوای ئەمانی کرد و لەبەرابەردا، شارەکەی بەوان سپارد. مونیر رازی بوو. ئەو سامانی خۆی هەلگرت و بەرێکەوت و هیچ ناوونیشانێکی لەخۆی بەجێنەهێشت تا میسرییەکان فێلی لێ نەکەن. ئەو رووی کردە رەققە و دەستی بەسەر ئەو شاردا گرت و مونیر فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی گرتەدەست و دانیشتووانی ئەو شارە بەهاتنی ئەو شادمان بوون. بەخواستی خوا لەگێڕانەوەی رووداوەکانی سالی ٣٨١/٩٩١ زایینی پاشماوەی بەسەرهاتی بەکجور و چۆنیەتی کوژرانی ئەو باس دەکەین.

## سەرکەوتنی ئەسفەر بەسەر قەرەمتییەکان

لەم سالەدا پیاوێك بەناوی ئەسفەر لەمنالەکانی مونتەفیق دەستەیەکی کۆکردەوە و لەگەل قەرەمتییەکان جەنگی. لەو جەنگەدا سەرکردەی قەرەمتییەکان کوژرا و سوپاکەی هەلاتن و ژمارەیەك لەوان کوژران و ئەسیر کران.

ئەسفەر رێگەی ئەحسای گرتەبەر و قەرەمتییەکان لەوێ سەنگەریان گرت. ئەو رێگەی قەتیفی گرتەبەر و هەموو ئەو کۆیلە و چوارپێ و سامانەی تالانی کردبوو، لەگەل خۆی بردییە بەسرە.

## گێڕانەوەی کردەوەیەکی چاکە

لەسەرەتای موحەرەم/ ئاوریلی ئەم ساڵە، ساحەب کوڕی عیباد، دینارێکی بەفەخر ئەلدەولە پێشکەش کرد کەکێشەکەی هەزار مسقاڵ بوو، لەدیوێکی سکەکە نووسرابوو:

| | |
|---|---|
| و احمر یحکی الشمس شکلا و صورة | فأوصافه مشتقة من صفاته |
| فان قیل دینار فقد صدق اسمه | و ان قیل الف کان بعض سماته |
| بدیع و لم یطبع علی الدهر مثله | و لا ضربت اضرابه لسراته |
| فقد ابرزته دولة فلکیة | اقام بها الاقبال صدر قناتة |
| و صار الی شاهانشاه انتسابه | علة انه مستصغر بطول حیاته |
| تانق فیه عبده و ابن عبده | و غرس ایادیه، و کافی کفاته |

واتاکەی: سووربارێکە لەبوون و نوما هاوشێوەی هەتاوە و شێوەی لەسرشتەکانییەوە وەرگیراوە. ئەگەر بەدینار ناوی ببەن، راستیان وتووە و ئەگەر بەهەزاری بزانن، بەشێکی ئەویان زانیوە. دینارێکە سەرسوڕهێنەر کە نە لەرۆژگار و نەبۆ گەورەکانی رۆژگار هاوشێوەی لێدراوە. ئەم دینارە حکومەتێکی ئاسمانی هێناویەتییە بوون، حکومەتێك کەبەخت و شانس ئامێزی بۆ کردۆتەوە. ڕەچەڵەکی فەخر ئەلدەولە بەشای شاکان دەگات، کەسێکی وەك کەدنیاخوازەکان بەهیچ لەقەڵەم دەدات. ئەم دینارە ئەوەمان نیشان دەدات کەهاوشێوەی کێشەکەی چەندین ساڵ دەمێنێتەوە و ئەمە مژدەی تەمەنی درێژی فەخر ئەلدەولە بەجیهان دەدات. بەندە و بەندەزادەی فەخر ئەلدەولە و دەست پەروەردە و نزیکترین هاورێی ئەو، لەم دینارەدا، خۆی نیشان داوە.

لەڕوویەکی دیکەی ئەم سکە، سوڕەی اخلاص و نازناوی خەلیفە تائیع لله و نازناوی فەخر ئەلدەولە و ناوی جورجان دەبینرا.

(دولە فلکیە) (کە لەم هۆنراوەدا ئاماژەی پێدراوە) لەنازناوی فەخر ئەلدەولە وەرگیراوە کە فلك الامة بوو و (کافی کفاتە) نازناوی ساحەب کوڕی عیبادە کە(کاف الکفاة) بوو.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا لەسەرزەمینی چیاکان بەبەردەوامی باران دەباری و هەورەبروسکە ئاسمانی داگرتبوو. تەرزەی گەورە باری و دۆڵەکان پڕ ئاو و ڕووبار و چاڵاوەکانیش بەهەمان شێوە لێوانلێو بوون لەئاو. ماڵەکان وێران بوون و قەناتەکان بەبەرد و گڵ پڕ بوونەوە و ڕێگەکان بەستران.

لەم ساڵەدا نەسر کوڕی حەسەن کوڕی فیرزان لەدامغان دژی فەخر ئەلدەولە ئالآی شۆڕشی بەرز کردەوە. فەخر ئەلدەولە، ئەحمەد کوڕی سەعیدی شەبیبی خوراسانی لەگەڵ سوپایەك لەدەیلەمییەکان لەڕەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە کرد تا ڕووبەڕووی نەسر ببێتەوە. نەسر کاتێك بینی، جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەحمەد دژوارە، نامەیەکی بۆ فەخر ئەلدەولە نووسی و ملکەچ بوونی خۆی نیشاندا. فەخر ئەلدەولە ڕازی و ئەوی لەسنوورەکەیدا هێشتەوە.

لەم ساڵەدا ئەمیر باوکی عەلی کوڕی فەخر ئەلدەولە لەمانگی ڕەجەب/ ئۆکتۆبەر مرد.

لەم ساڵەدا لەبەسرە و بوتەیحە لەبەر گەرمای زۆر، کۆلێرا دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن تا ئەو جێگەی کۆڵان و گەڕەکەکان لەجەنازەکان لێوانلێو بوو.

لەپێنجی شەعبان/ نۆزدەی نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، دوای نیمەڕۆ گێژەڵووکە تەنگی بەخەڵکان هەڵچنی و لەفەم ئەلسولح تۆفانێکی گەورە هەڵیکرد و بەشێکی مزگەوتی شارەکەی وێران کرد و ژمارەیەك لەخەڵکی لەناو برد. ژمارەیەکی زۆر لەکەشتییەکان و سەرنشینەکانی نغرۆ بوون و بەلەمی چوارپێکان لەشوێنەکانیان هەڵکەنران.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی یەعقوبی موفید مرد. ئەو حەدیس بێژێکی گەورە بوو. لەساڵی ٨٩٧/٢٨٤ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی حامید محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسحاق حاکمی نەیشابوری لەمانگی ڕەبیع الاوەل/ جون مرد. ئەو چەندین نوسراوی لەخۆی بەجێهێشتووە.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و حەفتا و نۆی کۆچی ( ٩٨٩ و٩٩٠ زایینی )

### کوێر کردنی چاوەکانی سەمسام ئەلدەولە

نەحریری خزمەتکار بەردەوام شەرەف ئەلدەولەی هان دەدا بۆ ئەوەی سەمسام ئەلدەولەی برای بکوژێت بەڵام شەرەف ئەلدەولە بەم کارە ڕازی نەدەبوو. کاتێك شەرەف ئەلدەولە نەخۆش کەوت، نەحریر لەسەر مەبەستەکەی خۆی پێداگری کرد و بەشەرەف ئەلدەولەی وت: فەرمانڕەوایی بەزیندوو مانەوەی سەمسام ئەلدەولە زیانی بەردەکەوێت، ئەگەر نایکوژیت، چاوەکانی کوێر بکە. شەرەف ئەلدەولە، محەممەدی شیرازی فەڕاشی بۆ ئەنجامدانی ئەم فەرمانە بۆ لای سەمسام ئەلدەولە نارد، بەڵام پێش ئەوەی محەممەدی فەڕاش بگاتە لای سەمسام ئەلدەولە، شەرەف ئەلدەولە مرد. کاتێك فەڕاش گەیشتە ئەو قەڵای سەمسام ئەلدەولە لەوێ زیندانی بوو، لەکوێر کردنی ئەو چاوی پۆشی و لەوێ لەگەڵ باوکی قاسم عەلا کوڕی حەسەنی نازر، ڕاوێژی کرد و ئەو بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکە هانیدا. محەممەدی فەڕاش چاوی ئەوی کوێر کرد لەکاتێکدا سەمسام ئەلدەولە بەردەوام دەیوت: کەس جگە لەعەلا منی کوێر نەکرد چوونکە ئەو فەرمانی پاشایەکی مردووی ئەنجامدا.

### مەرگی شەرەف ئەلدەولە و فەرمانڕەوایی بەها ئەلدەولە

لەسەرەتای جومادی الاخرە/ شەشی سێپتامبەری ئەم ساڵە، فەرمانڕەوا، شەرەف ئەلدەولە باوکی فوراس شیرزیل کوڕی عێزەد ئەلدەولە بەهۆی نەخۆشی کەم ئاوی مرد. جەنازەی ئەویان بردە لای ئارامگای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەخاکیان سپارد. ئەو دوو ساڵ و هەشت مانگ فەرمانڕەوایەتی عێراقی کرد. لەکاتی مەرگ، تەمەنی بیست و هەشت ساڵ و پێنج مانگ بوو.

کاتێك نەخۆشییەکەی تەنگی پێ هەڵچنی، باوکی عەلی بۆ سەرزەمینی فارس ڕەوانە کرد و گەنجینەی فراوان و توێشوو و هێزی فراوان و ژمارەیەکی زۆر

لەتورکەکانی لەگەڵ ئەو نارد. کاتێک هاوەڵانی شەرەف ئەلدەولە لەچاکبوونەوەی ئەو بێ هیوا بوون، گەورەکان لەدەوری کۆبوونەوە و داوایان لێکرد کەسێک وەک فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان بکات. شەرەف ئەلدەولە وتی: من گرفتار لەوەم داواکەی ئێوە ئەنجام بدەم. ئەوان داوایان لێکرد تا ڕۆژی چاکبوونەوەی، بەها ئەلدەولە باوکی نەسر وەک فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان بکات تا خەڵکان بپارێزێت و ڕێگە لەدروست بوونی ئاژاوە بگرێت. شەرەف ئەلدەولە ئەو کارەی کرد. بەها ئەلدەولە سەرەتا رازی نەبوو بەڵام دواتر ملکەچ بوونی بۆ فەرمانی براکەی نیشاندا.

کاتێک شەرەف ئەلدەولە مرد، بەها ئەلدەولە، جڵەوی کاروباری وڵاتی گرتەدەست و پرسەی بۆ براکەی گێڕا. خەلیفە تائیع بۆ دڵنەوایی کردنی بەها ئەلدەولە، ڕۆشتە زەبزەب. بەها ئەلدەولە پێشوازی لێکرد و سەری کڕنوشی دانەواند. خەلیفە ڕۆشتە ماڵەکەی و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بەبەها ئەلدەولە بەخشی. بەها ئەلدەولە، باوکی مەنسور کوڕی ساڵحانی وەک وەزیری خۆی دەستنیشان کرد.

## ڕۆشتنی ئەمیر باوکی عەلی کوڕی شەرەف ئەلدەولە بۆ فارس و دەرئەنجامی کاری ئەو لەگەڵ سەمسام ئەلدەولە

کاتێک نەخۆشی شەرەف ئەلدەولە تەشەنەی سەند، کوڕەکەی، ئەمیر باوکی عەلی ئامادە و لەگەڵ دایک و کەنیزەکانی بەرەو فارس ڕەوانەی کرد و زۆربەی سامانەکان، گەوهەر وکەرەستەکانی جەنگی لەگەڵ ئەوان نارد. کاتێک ئەمیر باوکی عەلی گەیشتە بەسرە، لەمەرگی شەرەف ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە. ئەو هەموو سامانەکەی لەڕێگەی دەریاوە بۆ ئەرجان نارد و خۆی بەخێرایی بەرەو ئەو شارە بەرێکەوت. تورکەکان لەوێ لەدەوری کۆبوونەوە و هەموویان ڕێگەی شیرازیان گرتەبەر. کارگوزاری ئەو دیارە، باوکی قاسم عەلا کوڕی حەسەن نامەی بۆ نووسین تا خۆیان بەشارەکە بگەیێنن و شارەکەی بەوان سپارد. پاسەوانانی ئەو قەڵایەی

سەمسام ئەلدەولە و براکەی تیا زیندانی کرابوو، ئەو دوانەیان لەگەڵ فولاد رزگار کرد و ئەوان ڕێگەی سیرافیان گرتەبەر.

ژمارەیەکی زۆر لەدەیلەمییەکان پەیوەستی سەمسام ئەلدەولە بوون وئەمیر باوکی عەلی بەرەو شیراز بەڕێکەوت و لەوێ لەناو تورکەکان و دەیلەمییەکان ئاژاوە سەریهەڵدا. ئەمیر باوکی عەلی لەماڵەکەی هاتەدەر و ڕۆشتە ئوردووگای تورکەکان. دەیلەمییەکان خۆیان کۆکردەوە و بڕیاریاندا بیگرن و تەسلیم بەسەمسام ئەلدەولەی بکەن بەڵام بینیان ڕۆشتۆتە لای تورکەکان. دەیلەمییەکان جوێنبارانی تورکەکانیان کرد و جەنگ و ئاژاوە چەند ڕۆژێك لەنێوان ئەوان بەردەوام بوو.

دواتر باوکی عەلی و تورکەکان هێرشیان کردە سەر فەسا و دەستیان بەسەردا گرت و سامانەکانیان تاڵان و دەرفەتی جووڵەیان بەدەیلەمییەکانی ئەو سەرزەمینە نەدا و کەرەستەکانی جەنگی ئەوانیان کۆکردەوە و خۆیان پێ بەهێز کرد.

باوکی عەلی ڕۆشتە ئەرجان و تورکەکان بۆ شیراز گەڕانەوە و لەگەڵ سەمسام ئەلدەولە و دەیلەمییەکان دژی ئەو جەنگان وشارەکەیان تاڵان کرد و بۆ لای باوکی عەلی لەئەرجان گەڕانەوە و ماوەیەك لای ئەو مانەوە.

لەم کاتەدا پەیکێك لەلایەن بەها ئەلدەولە هاتە لای باوکی عەلی و لەپەیامی بەها ئەلدەولە ئاگاداری کردەوە. بەها ئەلدەولە ڕێزی لەباوکی عەلی گرت و بەڵێنی پێدا بەڵام بەنهێنی لەگەڵ تورکەکان ئاخاوت و ڕێزی گرتن و تەماحی خستنە بەردەم. ئەوانیش ڕۆشتنی باوکی عەلی بۆ لای بەها ئەلدەولەیان بەپەسەند کراو زانی. باوکی عەلی بۆ لای ئەو بەڕێکەوت و لەنیوەی جومادی الاخرەی ٣٨٠/دوانزەی سێپتامبەری٩٩٠ لەواست چاوی بەبەها ئەلدەولە کەوت. بەها ئەلدەولە ئەوی لای خۆی جێگە کردەوە و ڕێزی گرت. دواتر چەند ڕۆژێك ئەوی پشتگوێ خست و سەرئەنجام قۆلبەستی کرد و ماوەیەك دواتر کوشتی. لەم کاتەدا بەها ئەلدەولە ڕێگەی ئەهوازی گرتەبەر تا خۆی بەسەرزەمینی فارس بگەیێنێت.

## ئاژاوەی تورکان و دەیلەمییەکان لەبەغداد

لەم ساڵەدا لەنێوان تورکەکان و دەیلەمییەکان لەبەغداد ئاژاوە سەریهەڵدا و جەنگی نێوان ئەوان پێنج رۆژ درێژەی کێشا و بەها ئەلدەولە لەماڵەکەی خۆی بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی نامەی بۆ نووسین بەڵام کەس گوێی لەوتەکانی ئەو نەدەگرت و ژمارەیەك لەنێردراوەکان کوژران.

لەم کاتەدا بەها ئەلدەولە لەماڵەکەی خۆی رۆشتەدەر و لەگەڵ تورکەکان جەنگی. ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و خراپەکاری بڵاو بوویەوە و ئەو دووبارە سازی ئاشتی ژەنی و رێگەی سازانی لەگەڵ تورکەکانی گرتەبەر و نامەی بۆ دەیلەمییەکان نووسی و بارودۆخی نێوان ئەوان سەقامگیر بوو و سوێندیان خوارد. ئەم جەنگە دوانزە رۆژ درێژەی کێشا.

دواتر دەیلەمییەکان بڵاوەیان لێکرد و دەستە دەستە شوێن کاری خۆیان کەوتن. دەستەیەك لەوان دوورخرانەوە و ژمارەیەکیان قۆڵبەست و زیندانی کران و هێزیان لەدەستدا و بەپێچەوانەوە تورکەکان بەهێز و پێگەیان بەرز بوویەوە.

## رۆشتنی فەخر ئەلدەولە بۆ عێراق و دەرئە نجامەکەی

لەم ساڵەدا فەخر ئەلدەولە کوڕی رۆکن ئەلدەولە لەڕەی بەرەو هەمەدان بەرێکەوت تا خۆی بەعێراق بگەیێنێت و فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینە بگرێتەدەست.

هۆکاری ئەم جموجۆڵە ئەوە بوو ساحەب کوڕی عیباد، عێراق بەتایبەتی بەغدادی خۆش دەویست و دەیویست بەغداد ئاوەدان بکاتەوە و چاوەڕوانی ئەم دەرفەتە بوو. کاتێك شەرەف ئەلدەولە مرد، زانی کاتی هاتووە. کەسانێکی هەڵبژارد تا تەماحی فەرمانڕەوایەتی عێراق لەروانگەی فەخر ئەلدەولە برازێننەوە و گرتنی ئەم وڵاتەی بەکارێکی ئاسان بێننە بەرچاو. ساحەب، خۆی لەترسی دواهاتەکانی ئەم کارە، هیچی نەدەکرد تا ئەوەی فەخر ئەلدەولە پێی وت: بۆچوونی تۆ لەمبارەوە چییە؟ ساحەب لەوەڵامدا ئەمەی بەبەختی بەرزی فەخر ئەلدەولە لەقەڵەمدا کەکارەکانی بۆ ئاسان دەکات. ئەو عێراقی بەگەورە وەسف

کرد. فەخر ئەلدەولە خۆی ئامادە و ڕێگەی هەمەدانی گرتەبەر. لەم کاتەدا بەدر کوڕی حەسنەوییە پەیوەستی بوو و دەبیس کوڕی عەفیفی ئەسەدی مەبەستی پەیوەست بوون بەوی کرد. بڕیاردرا ساحەب کوڕی عیباد و بەدر لەم ڕێگەوە بەرەو عێراق بڕۆن و فەخر ئەلدەولە لەڕێگەی خوزستانەوە. کاتێك ساحەب بەڕێکەوت، فەخر ئەلدەولەیان لەو ترساند کەئەگەری هەیە دڵنەوایی منداڵەکانی عێزەد ئەلدەولە بکات و ئەوان بۆ فەرمانڕەوایەتی بگەڕێنێتەوە. ئەو ساحەبی گەڕاندەوە و لەگەڵ خۆی ئەوی بۆ ئەهواز برد و فەرمانڕەوایەتی شارەکەی گرتەدەست و دژایەتی و ناسازگاری سوپای ئەهوازی کرد و باروودۆخی لێ دژوار کردن و مانگانەی پێنەدان، خەڵکان گومانی خراپیان لێکرد و سوپاکەیشی هەستیان بەم بەدگومانییە کرد و وتیان: ئەو، ئەو کاتەی بەخواستەکانی خۆی بگات، ئەو بەڵایش بەسەر ئێمەدا دێنێت، لەبەر ئەمە سستییان لەخۆیان نیشاندا. ساحەبیش لەو تۆمەتانەی بۆیان هەڵبەستبوو، پەرێشان بوو بەڵام خۆڕاگری کردە پیشە و کاروبارەکان بەبێدەنگی لەیەك پچڕان. کاتێك بەها ئەلدەولەیان لەهاتنی ئەوان بۆ ئەهواز ئاگادار کردەوە، سوپایەکی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد و ڕووبەڕووی سوپای فەخر ئەلدەولە بوونەوە.

بەڕێکەوت ئاوی ڕووباری کارون زیادی کرد و بووە هۆی وێران بوونی پردەکان. سوپای فەخر ئەلدەولە ئەمەی بەفریو لەقەڵەمدا و ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. فەخر ئەلدەولە لەم ڕووداوە پەرێشان بوو. ئەو کەبەردەوام گرنگی بەبۆچوونەکانی خۆی دەدا، ئەمجارە گرنگی بەبۆچوونی ساحەبدا. ئەو پێشنیاری پێکرد ڕۆژانەی سوپاییەکان بدات و کاروباری سەربازەکان ڕێکبخات. ساحەب وتی: بۆچوونی ڕاست لەم کاتانەدا ئەوەیە پارە بدەیت و سوپاییەکان لەدژواری ڕزگار بکەیت، ئەگەر تۆ پارە بدەیت، بەڵێن دەدەم دوای یەك ساڵ، چەند بەرابەر بەدەست بێنیت. فەخر ئەلدەولە ئەو کارەی نەکرد و ژمارەیەکی زۆر لەسوپاییەکانی ئەهواز لەدەوری بڵاوەیان لێکرد و کێشەکانی زیاتر و زیاتر بوون. بەناچاری بۆ ڕەی گەڕایەوە و لەڕێگە ژمارەیەك لەسەرکردەکانی ڕازی گرت و هاوەڵانی بەها ئەلدەولە ئەهوازیان خستە ژێر فەرمانی خۆیان.

## هەڵاتنی قادر باللە بۆ بوتەیحە

لەم ساڵەدا قادر باللە لەدەستی خەلیفە تائیع بۆ بوتەیحە هەڵات و لەوێ پەنای گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك ئیسحاق کوڕی موقتەدر، باوکی قادر، مرد، قادر و خوشکەکەی لەسەر پارچە زەوییەك ناسازگاری و دژایەتی یەکتریان کرد. لەم کاتەدا خەلیفە تائیع نەخۆش کەوت و دوای ماوەیەك باشبوویەوە و خوشکەکەی قادر لای تائیع باللە خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان و وتی: قادر ئەو کاتەی تۆ نەخۆش بووی، بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت هەوڵی دەدا. تائیع گومانی لەقادر کرد و باوکی حەسەن کوڕی نوعمانی لەگەڵ دەستەیەك بۆ گرتنی ئەو ڕەوانە کرد. قادر لەم کاتەدا لەحەریمی تاهیری بوو. ئەوان بۆ گرتنی قادر لەرێگەی ئاوەوە ڕۆشتن.

قادر لەخەودا بینیبووی وەك بڵێی پیاوێك ئەم ئایەی بۆ دەخوێنێتەوە: (( کەسانێك کەخەڵکان پێیان وتن: خەڵکان بۆ جەنگی ئێوە کۆبوونەتەوە، لەوان بترسن، بەڵام ئەم وتەیە، ئیمانی ئەوانی زیاتر کرد و وتیان: خواوەند بۆ ئێمە بەسە و باشترین پشتیوانە.))[٨]

ئەم خەوەی بۆ کەسەکانی گێڕایەوە و زیادی کرد: لەو کەسەی شوێنپێی من هەڵدەگرێت، دەترسم. لەم کاتەدا هاوەڵانی خەلیفە تائیع هاتن و بەدوای ئەودا گەڕان. قادر ویستی جلەکانی بپۆشێت بەڵام مۆڵەتیان پێنەدا. ژنەکان بەزۆر لەدەست سەربازەکان رزگاریان کرد و ئەو لەماڵەکەی ڕۆشتەدەر و خۆی شاردەوە. دواتر بەرەو بوتەیحە بەرێکەوت و ڕۆشتە بارەگای موهەزیب باللە. موهەزیب رێزی گرت و پارێزگاری کردنی گرتە ئەستۆ و لەخزمەت کردنی ئەو زێدەڕۆیی کرد. قادر لای ئەو مایەوە تا خەلافەتی گرتەدەست. کاتێك لەسەر تەختی خەلافەت دانیشت، ئەم ئایەی لەسەر ئەنگوستیلەکەی خۆی نووسی : ((حسبنا الله و نعم الوكيل)

---

[٨]- آل عمران/ ١٧٣ الذين قال لهم الناس ان الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم فزادهم ايمانا و قالوا حسبنا الله و نعم الوكيل.

گەڕانەوەی منالەکانی حەمدان بۆ موسڵ

لەم ساڵەدا باوکی تاهیر ئیبراهیم و باوکی عەبدوللە حسەین، دوو کوڕەکەی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان، دەستیان بەسەر موسڵدا گرت.

هۆکارەکەی ئەوە بوو ئەم دووانە لەبەغداد خزمەتی شەرەف ئەلدەولەیان دەکرد. کاتێك شەرەف ئەلدەولە مرد و بەها ئەلدەولە هاتە سەرکار، داوای مۆڵەتیان کرد تا بەرەو موسڵ بڕۆن. بەها ئەلدەولە مۆڵەتی پێدان و ئەوان رێگەی موسڵیان گرتەبەر. سەرکردەکانی بەها ئەلدەولە هەستیان بەناڕاستی ئەم کارە کرد. بەها ئەلدەولە نامەیەکی بۆ خواشازە کارگوزاری موسڵ نووسی و فەرمانی پێدا ئەو دوانە لەشارەکە دوور بخاتەوە. خواشازە پەیکی بۆ لای ئەوان نارد و داوای لێکردن شارەکە بەجێبێڵن. ئەوان بەنەرمی وەڵامیان دایەوە و لەولا بەخێرایی ئەسپیان غاردا و لەدێری ئەعلا لەدەرەوەی موسڵ ئۆردوویان لێدا.

دانیشتووانی موسڵ کاتێك لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە، هێرشیان کردە سەر تورك و دەیلەمییەکان و سامانی ئەوانیان تالان کرد و بۆ پەیوەست بوون بەمنالەکانی حەمدان بەرێکەوتن. دەیلەمییەکان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان هاتنە گۆڕەپانی جەنگ بەڵام لەمنالەکانی حەمدان و خەڵکانی موسڵ شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و کەسانی دیکە لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی بۆست نیشتەجێ بوون.

موسڵییەکان بڕیاریاندا بیانکوژن و لەشەڕی ئەوان خۆیان ئاسوودە بکەن بەڵام منالەکانی حەمدان رێگەی ئەو کارەیان لێگرتن و خواشازە و هاوەڵانی ئەویان بۆ بەغداد نارد و خۆیان لەموسڵ مانەوە. عەرەبەکان بەزۆری پەیوەستیان دەبوون.

## ناسازگاری کەتامە لەگەڵ مەنسور

لەم ساڵەدا پیاوێکی دیکە لەکەتامە دەرکەوت بەناوی باوکی فەرەج و کەس نەیزانی خەڵکی کوێیە. ئەو گومانی دەکرد باوکی منالی قائیمی عەلەوییە و باوەگەورێی مۆعیز لدین الله یە. زیاتر لەباوکی فەهم هەوڵیدا و خەڵکانی کەتامە لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو کوس و تەپڵەکانی هێنایەدەنگ و سکەی لێدا و لەنێوان

ئەو و جێگری مەنسور و سوپاکەی لەشاری میلە و سەتیف چەندین جەنگ ڕوویدا. مەنسور لەگەڵ سوپایەك هێرشی کردەسەر. ئەویش سوپای کەتامەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی مەنسور بردە گۆڕەپانی جەنگ. لەنێوان دوو سوپا، جەنگی مەترسیدار ڕوویدا و سەرئەنجام، باوکی فەرەج و سوپای کەتامە شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان کوژران. باوکی فەرەج لەئەشکەوتی چیایەك خۆی شاردەوە. دوو گەنجی هاوڕێی هێرشیان کردەسەر و ئەویان گرت و بردیانە لای مەنسور. مەنسور شادمان و بەقێزەونترین شێوە ئەوی کوشت.

مەنسور هەموو ناوچەکانی کەتامەی لەسوپا لێوانلێو کرد و کارگوزارەکانی خۆی لەو سەرزەمینە بڵاو کردەوە. پێش ئەو هیچ کارگوزارێك نەڕۆشتبووە ئەو سەرزەمینە. مەنسور باجی ئەو سەرزەمینەی کۆکردەوە و بارودۆخی لەخەڵکان دژوار کرد.

مەنسور بۆ شاری ئەشیر گەڕایەوە و لەوێ سەعید کوڕی خەزرونی زەناتی ڕۆشتە لای. باوکی سەعید لەساڵی ٩٧٥/٣٦٥ زایینی دەستی بەسەر سەجلماسەدا گرتبوو. سەعید ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکانی مەنسور نیشاندا و ببووە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی ئەو و لای مەنسور پێگەیەکی بەرزی پێبڕابوو. ڕۆژێك مەنسور پێی وت: ئەی سەعید! ئایا کەس بەخشندەتر لەمن دەناسیت؟ لەو کاتەدا مەنسور سامانێکی زۆری خستبووە بەردەستی سەعید. سەعید وتی: بەڵێ، من لەتۆ بەخشندەترم. مەنسور وتی: چۆن؟ سەعید وتی: چوونکە تۆ پارەت بەمن بەخشی و من گیانی خۆم. مەنسور ئەوی کردە فەرمانڕەوای تونبە و یەکێك لەکچەکانی سەعیدی کردە هاوسەری یەکێك لەکوڕەکانی. دەستەیەك لەکەسەکان، مەنسوریان بۆ ئەم کارە سەرکۆنە کرد. مەنسور لەوەڵامی ئەواندا وتی: باوك و باوەگەورێم بەزۆری شمشێر ئەوانیان ملکەچ دەکرد بەڵام من هەرکەسێك ڕمێکم بۆ بهاوێت، هەمان ڕمی بۆ دەهاوم تا خۆشەویستی من لەدڵی جێگیر ببێت.

سەعید بۆ لای بنەماڵەکەی خۆی گەڕایەوە و تا ساڵی ٩٩١/٣٨١ مایەوە و دواتر سەردانی مەنسوری کرد. سەعید چەند ڕۆژێك نەخۆش کەوت و لەسەرەتای ڕەجەبی ئەم ساڵە/ پێنجی ئۆکتۆبەر کۆچی دوایی کرد. ئەوسا فلفل کوڕی

سەعید ڕۆشتە بارەگای مەنسور و مەنسور ڕێزی گرت و پارەیەکی زۆری خستە بەردەست و ئەوی لەجیاتی باوکی وەك فەرمانڕەوای تونبە دەستنیشان کرد.

## ناسازگاری مامی مەنسور لەگەڵ مەنسور

لەم ساڵەدا باوکی بەهار، مامی مەنسور کوڕی یوسفی بولکین، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، ناسازگاری مەنسوری کرد چوونکە مەنسور ئەوەی کردبوو کەسرشتی ڕێزداری باوکی بەهار نەیتوانی پێی رازی بێت. مەنسور هێرشی کردە سەر مامەکەی خۆی لەتاهەرت بەڵام مامی و بنەماڵەکەی و هاوەڵانی ئەو شارەیان بەرەو رۆژئاوا بەجێهێشت. سوپاکەی تاهرەت ڕۆشتە تاهەرت و تالآنی کرد. دانیشتووانی تاهەرت داوای ئەمانیان بەرز کردەوە و ئەمانی پێبەخشین. ئەو شوێنپێی مامی هەڵگرت تا ئەوەی حەڤدە مەنزڵ لەتاهەرت دوورکەوتەوە و سوپاییەکان گرفتاری سەختی و دژوار بوونەوە.

مامی مەنسور مەبەستی زیری کوڕی عەتییە، فەرمانڕەوای فاسی کرد. زیری ڕێزی گرت و پێگەیەکی بەرزی پێبەخشی و سوپاییەکانی ئەو بەردەوام بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر سنووری دەسەڵاتی مەنسور.

ئەوان لەساڵی ٩٩١/٣٨١ زایینی مەبەستی هێرش کردنە سەر کەنارەکانی فاسیان کرد بەڵام گرفتاری سوپاکەی مەنسور بوون و سوپاکەی مەنسور سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. باوکی بەهار پەشیمان بوویەوە و گەڕایەوە بۆ بارەگای مەنسور. مەنسور ڕێزی گرت و دووبارە لەبەخشینەکانی ئەو کەڵکی وەرگرتەوە و هەموو نیازەکانی بۆ دابین کرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، باوکی حەسەن محەممەد کوڕی عومەری عەلەوی کوفی گرت. ئەو لەرۆژگاری شەرەف ئەلدەولە پێگەیەکی بەرزی بەدەست هێنابوو و پارەیەکی فراوانی لەبەردەستا بوو. کاتێك بەها ئەلدەولە هاتە سەرکار، باوکی حەسەنی موعەلیم خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان و تەماحی گرتنی سامان و زەوییەکانی ئەوی خستە بەردەم بەها ئەلدەولە. سامانەکەی لەبەر چاوی بەها ئەلدەولە فراوان و ئەوی قۆڵبەست کرد.

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە خەراجی لەوەرگەکانی سوادی پشتگوێ خست.

لەم ساڵەدا ئەمیر باوکی تالیب رۆستەم کوڕی فەخر ئەلدەولە چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی جەڕاحی تائی لەسەر ڕێگەی سومەیرا و فەید، ڕێگەی لەحاجییەکان گرت و ڕووبەڕوویان بوویەوە و سەرئەنجام بەوەرگرتنی سێسەد هەزار درهەم و چەندین دەست جل و بەرگ پەیمانی ئاشتییان بەست. کوڕی جەڕاح سامانەکەی وەرگرت و ڕێگەی بۆ کردنەوە.

لەم ساڵەدا بناغەی مزگەوتی هەینی بەغداد دارێژرا.

لەم ساڵەدا محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەباس کوڕی ئەحمەد کوڕی جەلاد باوکی عەباسی سولەمی نەقاش، لەوتاردەرەکانی ئەشعەری مرد. باوکی عەلی کوڕی شازان زانستی کەلام لەو فێر ببوو. حەدیسەکان بەبڕواپێکراو لەقەڵەم دەدرێت.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتای کۆچی( ٩٩٠و٩٩١ زایینی )

## چۆنیەتی کوژرانی بازکورد

لەم ساڵەدا بازکورد فەرمانڕەوای دیاربەکر کوژرا.

چۆنیەتی کوژرانەکەی بەم شێوە بوو: کاتێك باوکی تاهیر و حسەین، کورەکانی حەمدان، دەستیان بەسەر موسڵدا گرت، بازکورد، چاوی بڕییە موسڵ. ئەو کوردەکانی کۆکردەوە و ژمارەی سوپاکەی فراوان کرد. ئەو کوردانەی ملکەچی فەرمانەکانی بوون بریتین لە: دانیشتووانی بەشنویە، قەڵانشینەکانی فنەك کەژمارەیان فراوان بوو. حسەینی بەشنەوی، وتاردەری مناڵەکانی مەروان و خاڵی ئەوان، لەهۆنراوەیەکدا بەم شێوەیە هاوکاری بازکورد دەکات:

البشنوية انصار لدولتكم ... و ليس فی ذا خفا فی العجم و العرب

انصار باذ بأرجيش و شيعته ... بظاهر الموصل الحدباء فی العطب

بباجلايا جلونا عنه عمته ... و نحن فی الروع جلاؤون للكرب

واتاکەی: بەشنویە هاوەڵانی حکومەتەکەی ئێوەن و ئەمە لەناو عەرەبەکان و نا عەرەبەکان شاراوە نییە. هاوەڵانی باز لەئەرجەیشن و هاوەڵانی ئەو لەدەرەوەی شاری موسڵ پەرێشانن. ئێمە لەباجولایا لەو(بازکورد) خەم دەخۆین و ئێمە لەکاتی ترس خەم دەخۆین.

بازکورد نامەی بۆ خەڵکانی موسڵ نووسی و دڵنەوایی کردن. دەستەیەك لەخەڵکانی موسڵ پەیوەستی بوون و ئەو بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و لەبەشی رۆژهەڵاتی موسڵ ئوردووی لێدا. دوو کوڕەکەی حەمدان نەیاندەتوانی لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەن، لەبەر ئەمە نامەیەکیان بۆ باوکی زەواد محەممەد کوڕی موسەییب، فەرمانڕەوای مناڵەکانی عوقەیل نووسی و داوای هاوکارییان لێکرد. ئەو لەبەرابەر هاوکاری کردن، دوورگەی کوڕی عومەر و شارێك و چەند شتێکی دیکەی لەدوو کوڕەکەی حەمدان داوا کرد. ئەوان بەداواکەی رازی بوو و پەیمانیان بەست. باوکی عەبدوللە کوڕی حەمدان ڕۆشتە لای و باوکی تاهیر لەموسڵ مایەوە و ڕووبەڕووی بازکورد بوویەوە.

کاتێك باوکی عەبدوللە گەیشتە لای باوکی زەواد، بەرەو موسڵ بەرێکەوتن و لەدیجلە گوزەریان کرد و بێ ئەوەی بازکورد ئاگادار ببێتەوە، لەیەك زەوی لەگەڵ ئەو ئوردوویان لێدا. بازکورد کاتێك لەگوزەر کردنی ئەوان ئاگادار بوویەوە کەلێی نزیك ببوونەوە. باز مەبەستی ڕۆشتن بۆ چیاکەی کرد تا ئەم دەستەیە لەدواوە و باوکی تاهیر لەپێشەوە هێرشی نەکەنەسەر. هاوەڵانی ئەو بڵاوبونەوە و حەمدانییەکان پێیان گەیشتنەوە و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. بازکورد ویستی لەئەسپێکەوە بڕواتە سەر ئەسپێکی دیکە کەکەوتە سەرزەوی. خوشکەزاکەی، باوکی عەلی کوڕی مەروان هاوکاری کرد و ویستی سوار ئەسپەکەی بکات بەڵام نەیتوانی، لەبەر ئەمە بەجێی هێشت و ڕۆشت و پەنایان بۆ کێوەکە برد. باز لەناو کوژراوەکاندا کەوتبوو کەیەکێك لەعەرەبەکان ئەوی ناسییەوە و کوشتی و سەری بۆ منالەکانی حەمدان ڕەوانە کرد و خەلاتێکی گەورەی دەستکەوت. جەنازەی ئەویان لەموسڵ هەلواسی. دەنگی نارەزایەتی خەڵکان بەرز بوویەوە و وتیان: شیاو نییە لەگەڵ جەنگاوەرێکی بوێر بەو شێوەیە هەڵس وکەوت بکرێت. خۆشەویستی خەڵکان بۆ ئەو دەرکەوت. بازکوردیان هێنایەخوار و کفنیان کرد و نوێژیان لەسەر خوێند و بەخاکیان سپارد.

## هاتنە سەرکاری حکومەتی منالەکانی مەروان

کاتێك بازکورد کوژرا، خوشکەزاکەی، باوکی عەلی کوڕی مەروان لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان ڕۆشتنە قەلأی کیفا لەکەنارەکانی دیجلە. کیفا یەکێك لەبەهێزترین و تۆکمەترینی قەلاکان بوو. هاوسەر و منالەکانی بازکورد لەو قەلأیە ژیانیان بەسەر دەبرد. کاتێك باوکی عەلی گەیشتە قەلاکە، بەخالۆژنەکەی وت: خالم منی بۆ کارێکی گرنگ ناردۆتە لای تۆ. ژنی خاڵ، وتەکانی ئەوی بەراست زانی. کاتێك ڕۆشتە لای، ئەوی لەمەرگی خالی ئاگادار کردەوە و تەماحی بەستنی پەیوەندی هاوسەرگیری لەگەڵ خۆی خستەبەردەم. ئەو بەو مەرجە بەپێشنیارەکەی باوکی عەلی رازی بوو کەقەلا و چەند شوێنێکی دیکەی لەژێر فەرماندا بێت. باوکی عەلی یەك یەك دەستی بەسەر قەلاکاندا گرت تا ئەوەی بەسەر سنووری

خاڵیدا زاڵ بوو و بەرەو مەیافارقین بەرێکەوت. باوکی تاهیر و باوکی عەبدوللە، دوو کورەکەی حەمدان، چاوی تەماحییان بڕییە حکومەتەکەی. ئەو کاتەی بارودۆخی خۆیان سەقامگیر کرد، سوپایان کۆکردەوە و هێرشیان کردە سەر باوکی عەلی. جەنگ روویدا و دەرئەنجام باوکی عەلی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و باوکی عەبدوللە کوڕی حەمدانی ئەسیر کرد بەڵام ڕێزی گرت و بەشێوەیەکی شیاو هەڵس وکەوتی لەگەڵ کرد و دواتر ئەوی لەزیندان هێنایەدەر و ڕەوانەی براکەی کردەوە کە لەو کاتەدا گەمارۆی خستبووە سەر دیاربەکر. ئەو هاتە لای براکەی و پێشنیاری پێکرد لەگەڵ باوکی عەلی ڕێگەی سازگاری و ئاشتی بگرێتەبەر بەڵام باوکی تاهیر رازی نەبوو و باوکی عەبدوللە بەناچاری شوێن بڕیارەکانی براکەی کەوت و هەردووك هێرشیان کردە سەر کوڕی مەروان و بۆ جەنگی ئەو بڕیاریاندا. کوڕی مەروان سەرکەوتنی بەسەر هەردووکیان بەدەست هێنا و باوکی عەبدوللەی گرت و ئەمجارە بەشێوەیەکی خراپ لەگەڵی جووڵایەوە و بارودۆخی لێ دژوار کرد تا ئەوکاتەی فەرمانڕەوای میسر نامەی بۆ نووسی و بوو بەناوبژیوان و باوکی عەلی ئەوی ئازاد کرد.

باوکی عەبدوللە ڕێگەی میسری گرتەبەر و فەرمانڕەوایەتی حەلەبی لەفەرمانڕەوای میسر وەرگرت و تا سەرەمەرگ لەوێ مایەوە.

کاتێك تاهیر کاتێك گەیشتە نەسیبین، باوکی زەواد رووبەرووی بوویەوە و باوکی تاهیر و کوڕەکەی عەلی و موزەفەری، ئەمیری مناڵەکانی نومەیری گرت و خوێنی ڕشتن.

کوڕی مەروان لەدیاربەکر مایەوە و بارودۆخی ئەو شارەی ڕێکخست و چاکەکاری لەگەڵ خەڵکان کردە پیشە. خەڵکانی مەیافارقین چاوی تەماحیان تێبڕی و دەستدرێژییان کردە سەر هاوەڵانی. کوڕی مەروان تا رۆژی جەژن خۆڕاگری کرد. لەو رۆژە کەخەڵکان بۆ نوێژ هاتنەدەر و لەدەشت کۆبوونەوە، پۆشتە ناو شارەکە و باوکی سەقەر، گەورەی شارەکەی گرت و لەسەرەوەی دیواری شارەکە هەڵیدایە خوار و هاوەڵانیشی گرت. کوردەکان جل و بەرگی خەڵکانی شاریان بۆ خۆیان هەڵگرت و دەروازەکانی شارەکەیان بەسەر دانیشتووانەکەی داخست.

کوڕی مەروان فەرمانی بەخەڵکاندا بۆ کویێ دەخوازن بڕۆن چوونکە چیتر ڕێگەیان نییە بڕۆنە ناو شارەکە. خەڵکان هەرکام بەرەو ناوچەیەك ملی ڕێگەیان گرتەبەر.

کوڕی مەروان، خاتوونی ژنان(خاتونی خاتونەکانی ئەو دیارە) کچی سەعد ئەلدەولە کوڕی یوسف ئەلدەولە کوڕی حەمدانی کردە هاوسەری خۆی. ئەوی لەحەلەب هێنا وبڕیاریدا لەدیاربەکر نزیکی لەگەڵ بکات. شێخی شارەکە بەناوی عەبدبەڕ ترسا لەوەی ئەو بەلایان بەسەر بێنێت کەبەسەر خەڵکی مەیافارقین هێنانی. لەبەر ئەمە کەسە بڕواپێکراوەکانی شارەکەی کۆکردەوە وبۆ بەنهێنی هێشتنەوەی ئەم رازە سوێندیدان و وتی: ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەمیر دەخوازێت ئەو بەلاتان بەسەر بێنێت کەبەسەر خەڵکانی مەیافارقین هێنای. ئەو لەباب ئەلما دێتە ناو و لەباب ئەلجیهاد دەرواتەدەر. هەمووتان ڕیز ببەستن و درهەمی بەسەردا بلاو بکەنەوە. بەشێوەیەك درهەمەکان بەروخساریدا بکێشن کەناچار بێت دەست بەروخسارییەوە بگرێت و ئەوسا بەکێرد و شمشێر هێرشی بکەنەسەر و بیکوژن. ئەوان ئەو کارەیان کرد و دەرئەنجامەکەی بەو شێوەبوو کەشێخ پێشبینی کردبوو. کەسێك بەناوی کوڕی دەمنە کوشتنی ئەوی گرتە ئەستۆ. ئەو کەسێکی بوێر بوو. خەڵکان گێژ و پەرێشان بوون. سەری باوکی عەل کوڕی مەروانیان هەڵدایە ناو سوپاکەی و ئەوان بەخێرایی ڕێگەی مەیافارقینیان گرتەبەر.

دەستەیەك لەکوردەکان بڕیاریاندا دەست بەسەر مەیافارقیندا بگرن. پاسەوانی مەیافارقین لەگەڕانەوەی خێرایی خەڵکان سەریسوڕما و وتی: ئەگەر ئەمیر زیندووە، لەگەڵ ئەو وەرنە ناو شارەکە و ئەگەر مردووە، براکەی جێگەی ئەو دەگرێتەوە. براکەی باوکی عەلی، مەمهەد ئەلدەولە باوکی مەنسور کوڕی مەروان، بەخێرایی خۆی گەیاندە مەیافاریقین و پاسەوانی شار دەروازەکەی بۆ کردەوە. ئەو ڕۆشتە ناو شارەکە و جڵەوی کاروبارەکانی لەدەست گرت بەلام -ئاماژەی پێدەدرێت- تەنیا سکە بەناوی ئەو لێدرا و بەناوی ئەو وتاریان خوێندەوە.

عەبدبەڕ، دەستی بەسەر ئامەد گرت و کچەکەی خۆی کردە هاوسەری کوڕی دەمنە بکوژی باوکی عەلی. کوڕی دەمنە میوانییەکی ڕێکخست و لەو میوانییەدا عەبد بەڕی کوشت و ئامەدی خستە ژێر فەرمانی خۆی و شارەکەی ئاوەدان

کردەوە و لەکەنار دیواری شارەکە کۆشکێکی بۆ خۆی بەرز کردەوە و بارودۆخی خۆی لەگەڵ مەمهەد ئەلدەولە و هادی، پاشای رۆم، فەرمانڕەوای میسر و فەرمانڕەواکانی دیکە سەقامگیر کرد و پێگەی بەرز بوویەوە.

مەمهەد ئەلدەولە هاورێیەکی بوو بەناوی شەروە کە لەسنووری ئەو فەرمانڕەوایەتی دەکرد. شەروە کۆیلەکی بوو کەوەك سەرۆکی پاسەوانەکان دیاریکردبوو. مەمهەد ئەلدەولە ڕقی ئەم کۆیلەی لەدڵ گرت و چاوەڕوانی کوشتنی ئەوی دەکرد بەڵام بۆ ڕێز گرتن لەشەروە ئەو کارەی نەدەکرد. کۆیلە هەستی بەئەندێشەی ئەو کرد و پەیوەندی نێوان مەمهەد ئەلدەولە و شەروەی شێواند. شەروە لەقەڵای هەتاخ کەسنوری خۆی بوو، خواردنێکی ئامادە و مەمهەد ئەلدەولەی بانگێشت کرد و کاتێك هات، ئەوی کوشت. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٤٠٢/١٠١١ زایینی روویدا. شەروە لەماڵەکەی خۆی ڕۆشتە ماڵی ئامۆزاکانی مەمهەد ئەلدەولە و ئەوانی قۆڵبەست کرد و وای نیشاندا مەمهەد ئەلدەولە فەرمانی ئەم کارەی پێداوە. ئەولەوێوە ڕێگەی مەیافارقینی گرتەبەر. مەشخەڵەکان لەبەردەم ئەو دەسووتان. خەڵکانی مەیافارقین بەگومانی ئەوەی مەمهەد ئەلدەولەیە دەروازەکانیان کردەوە. ئەو مەیافارقینی خستە ژێر فەرمانی خۆی و نامەیەکی بۆ پاسەوانانی قەڵاکان نووسی و ئەوانی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد. کەسێکی بۆ قەڵای ئەرزەن نارد تا فەرمانڕەواکەی بێنێت. فەرمانڕەوای ئەرزەن بەخواجە باوکی قاسم ناو دەبرا. خواجە بەرەو مەیافارقین بەرێکەوت بەڵام قەڵاکەی تەسلیم بەنێردەکەی شەروە نەکرد. کاتێك گەیشتە نیوەی ڕێگە، لەکوژرانی مەمهەد ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە و بۆ قەڵای ئەرزەن گەڕایەوە و پەیکی بۆ لای ئەسعەرد نارد و باوی نەسر کوڕی مەروان برای مەمهەد ئەلدەولەی بردە لای خۆی. مەمهەد ئەلدەولە ئەم برای بەهۆی خەویێك، بەدوژمن دەزانی و لەخۆی دووری کردبوویەوە. ئەو لەخەودا بینیبووی وەك بڵێی هەتاو کەوتۆتە ژوورەکەی و باوکی نەسر لەسەر هەتاو شەڕی لەگەڵ کردبوو و سەرئەنجام لێی سەندبوو. لەبەر ئەمە براکەی لەشارەکە دەرکرد و بەشێوەیەکی نەشیاو ئەوی لەئەسعەرد هێشتەوە. کاتێك خواجە ئەوی بانگ کرد، دوبەیر پێی وت: ئایا هیچت دەست دەکەوێت؟ خواجە وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

لەلایەکی دیکە شەروە کەسانێکی بەدوای باوکی نەسر ناردبوو بەڵام ئاگادار بوونەوە ئەو ڕۆشتۆتە قەڵای ئەرزەن. شەروە لەم کاتەدا هەستی کرد بارودۆخی پەرێشانە. مەروان، باوکی مەمەد ئەلدەولە کەکوێر ببوو، لەگەڵ هاوسەرەکەی لەقەڵای ئەرزەن لای گۆڕی کوڕەکەیان ژیانیان بەسەر دەبرد. باوکی قاسم، باوکی نەسری بردە لای ئەوان و سوێندیدا فەرمانڕەوایەتی بگرێتەدەست و دادپەروەری بڵاو بکاتەوە. ئەو قازی و شایەتەکانی هێنا و قەڵای ئەرزەنی تەسلیم کرد. دواتر دەستی بەسەر سەرزەمینەکانی دیاربەکر گرت و بۆ ماوەیەکی درێژ فەرمانڕەوابوو، دادپەروەری کردە پیشە و پیاوە زاناکان لەهەموو کەنارەکانەوە لەدەوری کۆدەبوونەوە. ژمارەی ئەوان (زاناکان) لەسنوری دەسەڵاتی باوکی نەسر زیادی کرد.

لەو کەسانەی مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای باوکی نەسری کرد، باوکی عەبدوڵلەی کازەرونی بوو کەمەزهەبی شافعی لەسەر دەستی ئەو لەدیاربەکر بڵاو بوویەوە. شاعیرەکانیش هاتنە بارەگاکەی و وەسفیان دەکرد. ئەو خەڵاتی زۆری بەوان دەبەخشی. ئەو لەساڵی ١٠١١/٤٠٢ تا ساڵی ١٠٦١/٤٥٣ مایەوە و لەم ساڵەدا کۆچی دوایی کرد. لەکاتی مەرگ ساڵەکانی تەمەنی لەهەشتا و چەند ساڵ تێپەڕی. لەرۆژگاری ئەو سنورەکان ئارام و بەباشترین شێواز هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکان دەکرا. کاتێك مرد، کوڕەکەی جێگەی ئەوی گرتەوە.

## فەرمانڕەوایی بنەماڵەی موسەییب لەموسڵ

کاتێك باوکی تاهیر کوڕی حەمدان- وەك ئامارژەی پێدرا- لەباوکی عەلی کوڕی مەروان شکستی خوارد، لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەهاوەڵانی ڕێگەی نەسیبینی گرتەبەر. هاوەڵانی بڵاوەیان لێکرد.

باوکی زەواد محەممەد کوڕی موسەییب ئەمیری منالەکانی عوقەیل کەلەو کاتەدا فەرمانرەوای نەسیبین بوو -- ئامارژەمان پێدا- چاوی تەماحی تێبڕی و باوکی تاهیری لەگەڵ باوکی و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی گرت و ئەوانی کوشت و ڕێگەی موسڵی گرتەبەر و دەستی بەسەر ئەو شارە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری گرت.

نامەی بۆ بەها ئەلدەولە نووسی و داوای لێکرد یەکێك لەهاوەڵانی خۆی بۆ لای ئەو بنێرێت تا کاروبارەکانی پێ بسپێرێت. بەها ئەلدەولە یەکێك لەسەرکردەکانی خۆی ڕەوانە کرد.

بەها ئەلدەولە- ئاماژەی پێدەدەین- لەعێراقەوە بەرەو ئەهواز ڕۆشتبوو و جێگری بەها ئەلدەولە لەموسڵ مایەوە بەڵام تواناى ئەنجامی هیچ کارێکی نەبوو و تەنیا بەفەرمانی باوکی زەواد کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد. بەخواستی خواوەند چۆنیەتی کار و دەرئەنجامی ئەو باس دەکەین تا لای هەموان ئاشکرا بێت.

## ڕۆشتنی بەها ئەلدەولە بۆ ئەهواز و دەرئە نجامی کارەکانی ئەو لەگەڵ سەمسام ئەلدەولە

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە لەعێراقەوە ڕۆشتە خوزستان و لەوێوە ڕێگەی فارسی گرتەبەر. ئەو باوکی نەسر خواشازەی وەك جێگری خۆی لەبەغداد دەستنیشان کرد. ئەو گەیشتە بەسرە و ڕێگەی خوزستانی گرتەبەر و لەوێ لەمەرگی باوکی تاهیری برای ئاگادار بوویەوە و پرسەی بۆ گێڕا. ڕۆشتە ئەرجان و ئەو شارەی خستە ژێر فەرمانی خۆی و سامانەکانی زەوت کرد. ئەم سامانە بریتی بوو لەهەزار هەزار دینار و هەشتسەد هەزار درهەم و جل و بەرگ و گەوهەری بێ ژومار. کاتێك سوپا ئاگادار بوویەوە، بەردەوام شۆڕشی کرد و بەها ئەلدەولە بەناچاری ئەم سامانەی لەناو سوپاییەکان دابەش کرد و تەنیا کەمێکی بۆ خۆی مایەوە. پێشەنگەکانی سوپاکەی بەفەرماندەیی باوکی عەلا کوڕی فەزڵ ڕێگەی نەوبەندجانیان گرتەبەر. سوپاکەی سەمسام ئەلدەولە لەوێ جێگیر بوون. باوکی عەلا شکستی پێهێنان و سوپاکەی لەکەنارەکانی فارس بڵاو کردەوە. سەمسام ئەلدەولە سوپایەکی بەفەرماندەیی فولادی زەماندار بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان نارد. ئەم سوپایە ڕووبەڕووی سوپاکەی باوکی عەلا بوویەوە. باوکی عەلا شکستی خوارد و گەڕایەوە.

چۆنیەتی ئەم شکستە بەم شێوە بوو: لەنێوان دوو سوپا دۆڵێك جێگیر بوو و

پردێك لەسەر دۆڵەكە دەبینرا. هاوەڵانی باوكی عەلا لەپردەكە دەپەڕینەوە و كاڵاكانی دەیلەمییەكان یا سەربازەكانی سەمسام ئەلدەولەیان تاڵان دەكرد. فولاد لای پردەكە بۆسەی نایەوە و كاتێك سوپاكەی باوكی عەلا گوزەریان كرد، لەبۆسەكەی هاتەدەر و ئەوانی كوشتار كرد. فولاد نامەی بۆ باوكی عەلا نووسی و فریویدا و دواتر هێرشی كردەسەر وسەركوتی كرد. باوكی عەلا هەڵات و تێكشاو بۆ ئەرجان گەڕایەوە. نرخی شتومەك لەئەرجان بەرز بوویەوە.

بەهائەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و لەشیرازەوە هێرشی كردە سەر فولاد. نێردراوان لەهەردوولا هاتوچۆیان كرد تا ئەوەی بڕیاردرا سەرزەمینی فارس و ئەرجان لەژێر فەرمانی سەمسام ئەلدەولە بێت و خوزستان لەژێر فەرمانی بەها ئەلدەولەدا بێت و هەركام زەوی لەسنووری دەسەڵاتی ئەوی دیكەدا هەبێت. سوێندیان بۆ یەك خوارد و بەها ئەلدەولە بۆ ئەهواز گەڕایەوە.

كاتێك بەها ئەلدەولە بەغدادی بەجێهێشت، خراپەكاران لەهەردوو لای شار ئاژاوەیان نایەوە و شەڕ لەنێوان سونی و شیعەكان هەڵگیرسا و ژمارەیەك كوژران. چیتر كەس ملكەچی فەرمانەكان نەبوو. چەندین گەڕەك سووتێنران و سامانەكان بەفیڕۆ چوو و ماڵەكان وێران. ئەم بارودۆخە تا گەڕانەوەی بەها ئەلدەولە بۆ بەغداد چەندین مانگ درێژەی كێشا.

### بیركردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، وەزیرەكەی، باوكی مەنسور كوڕی ساڵحانی قۆڵبەست كرد و پێش ڕۆشتن بۆ خوزستان، باوكی نەسر شاپور كوڕی ئەردەشێری وەك وەزیر هەڵبژارد. بەڕێوەبەری حكومەتی بەها ئەلدەولە باوكی حەسەنی موعەلیم بوو كەفەرمانەكان بۆ ئەو دەگەڕایەوە.

لەم ساڵەدا باوكی فەرەج یەعقوب كوڕی یوسف كوڕی كلس، وەزیری عەزیز باللە، فەرمانڕەوای میسر مرد. ئەو پیاوێكی زاڵ بەسەر عەزیز باللە بوو. كاتێك نەخۆش كەوت، عەزیز باللە، فەرمانڕەوای میسر، سەردانی كرد و وتی: خۆزگە تۆ دەفرۆشرایت و من بەدانی هەموو سنورەكانی ژێر دەستم تۆم دەكڕی. ئایا نیازێك

هەیە بەدیهێنانی رەزامەندی تۆی لێ بکەوێتەوە؟ باوکی فەرەج گریا و دەستی عەزیزی ماچ کرد و وتی: لەوەی تایبەتە بەمن، تۆزیاتر رێزی دەگریت و پارێزگاری لێدەکەیت و لەوەی بۆ حکومەت دەگەڕێتەوە، تا ئەو جێگەی دەتوانی لەگەڵ حەمدانییەکان کە لەگەڵ تۆسازگارن، نەرمی بنوێنە وبەئارامی ئەوان رازی بە و ئەگەر موفەرەجت دەستکەوت، مەهێڵە زیندوو بێت.

کاتێك باوکی فەرەج مرد، عەزیز باللە خەمبار و لەرێ و رەسمی بەخاك سپاردنی ئامادە بوو. نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند و بەدەستی خۆی خۆڵی کردە ناو گۆڕەکەی. دیوانەکانی بۆ ماوەی چەند رۆژ داخست و دوای ئەو باوکی عەبدوللەی موسڵی وەك وەزیر هەڵبژارد بەلاَم دواتر ئەوی لابرد و عیسا کوڕی نەستورسی نەسرانی لەجێگەی ئەو دانا. ئەو شوێنکەوتەی مەسیحییەکان بوو و ئەوانی بۆ کاروبارەکان رادەسپارد و جێگرێکی یەهودی بۆ شام دەستنیشان کرد بەناوی مەنشا. ئەو بەهەمان شێوە لەگەڵ جوولەکەکان هەڵس و کەوتی دەکرد کەعیسا لەگەڵ مەسیحییەکان و خراپەی لەگەڵ موسوڵمانان دەکرد.

لەرەبیع الاوەل/ مەی ئەم ساڵە سەرکردایەتی عەلەوییەکان و سەرپەرەستی حەجی ئەوان بەشەریف باوکی ئەحمەد، باوکی سەیید رەزی سپێردرا و باوکی عەبدوللە ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوللەی عەلەوی بەنوێنەرایەتی باوکی ئەحمەدی موسەوی، رێ و رەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان بەجێهێنا.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان، فەقیهی حەنەفی، مرد. ئەو لەساڵی ٩٣٢/٣٢٠ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا عەبدوللە محەممەد کوڕی عەبد بەڕی نەمری، باوکی ئیمام باوکی عومەر کوڕی عەبد بەڕ، لەئاندۆلۆس مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و یەکی کۆچی( ٩٩١و٩٩٢ زایینی )

## چۆنیەتی گرتنی خەلیفە تائیع الله

لەم ساڵەدا خەلیفە تائیع بەدەستی بەها ئەلدەولە قۆڵبەست کرا. ئەو تائیع لله ئەبوبەکر عەبدکەریم کوڕی فەزڵ موتیع الله کوڕی جەعفەر موقتەدر باللە کوڕی موعتەزید باللە کوڕی باوکی ئەحمەد موەفەق کوڕی متوەکیل بوو.

هۆکاری قۆڵبەست کرانی ئەوە بوو کەسامانەکانی ئەمیر بەها ئەلدەولە کەمی کرد و سەربازەکان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە. بەها ئەلدەولە، شاپوری وەزیری گرت بەڵام بەگرتنی ئەو هیچ داهاتێکی دەستنەکەوت.

باوکی حەسەن کوڕی موعەلیم بەسەر بەها ئەلدەولەدا زاڵ بوو و فەرمانڕەوایەتی سنوورەکانی ئەوی دەکرد. باوکی حەسەن گرتنی خەلیفەی لەبەر چاوی بەها ئەلدەولە رازاندەوە و تەماحی زەوت کردنی سامانی ئەوی خستە بەردەم و بەکارێکی ئاسانی لەقەڵەمدا. بەها ئەلدەولە هەنگاوی بردەپێش و پەیکی بۆ لای خەلیفە نارد و داوای مۆڵەتی کرد تا بڕواتە کۆشکەکەی و دووبارە پەیمانی لەگەڵ ببەستێت. خەلیفە مۆڵەتی پێدا و وەك نەریت بۆ میوانداری کردنی ئەو دانیشت. بەها ئەلدەولە لەگەڵ ژمارەیەکی فراوان ڕۆشتە ژوور و سەری کوڕنوشی دانەواند. ئەویان لەسەر تەختێك دانیشاند. لەم کاتەدا یەکێك لەدەیلەمییەکان بەشێوەیەك هاتەپێش وەك بڵێی دەیویست دەستی خەلیفە ماچ بکات بەڵام دەستی خەلیفەی گرت و لەتەختەکەی هێنایەخوار. خەلیفە دەیوت: ئێمە لەلایەن خواوەندەوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. هاواری دەکرد بەڵام کەس فریای نەکەوت. گەنجینەکانی کۆشکی خەلیفە تاڵان کرا و دەستبەجێ سامانەکانیان لەکۆشك بردەدەر. خەڵك سەرقاڵی تاڵان کردنی سامانی یەکتر بوون. یەکێك لەم دەستەیە سەیید ڕەزی بوو کەگیانی دەرباز کرد و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە کەبەشێکی بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| من بعد ما كان رب الملك مبتسما | الى ادنوه فى النجوى و يدنينى |
| امسيت ارحم من قد كنت اغبطه | لقد تقارب بين العز و الهون |

و منظر كان بالسراء يضحكني　　　يا قرب ما عاد بالضراء يبكيني

هيهات اغتر بالسلطان ثانية　　　قد ضل ولاج ابواب السلاطين

واتاكەی: دوای ئەوەی فەرمانڕەوای وڵات بزەی بۆ دەگرتن، لەکاتی ورتە ورت ئەوم لەخۆم نزیك کردەوە و ئەویش منی لەخۆی نزیك کردەوە. ئەو کەسەی خۆشم دەویست و ڕژدیم پێدەبرد هەنووکە لەنێوان ڕێزداری و بەدبەختیدایە. ئەو دیمەنەی لەکاتی خۆشی بزەی دەهێنایە سەرلێوم چەندە زۆر گۆڕانی بەسەرداهات و لەکاتی ناخۆشی دەمگریێنێت. دوور بێت کەچیتر فریوی سوڵتانێك بخۆم چوونکە هەرکەس بڕواتە بارەگای سوڵتانەکان، گومڕایە.

کاتێك خەلیفە تائیعیان بردە ماڵەکەی بەها ئەلدەولە. دەستی لەکار کێشایەوە. ئەو حەڤدە ساڵ و هەشت مانگ و شەش ڕۆژ خەلافەتی کرد و کاتێك قادر بالله خەلافەتی گرتەدەست، خەلیفە تائیعیان بەو سپارد. ئەو لای قادر مایەوە تا لەساڵی ١٠٠٢/٣٩٣ زایینی لەشەوی جەژنی ڕەمەزان کۆچی دوایی کرد. قادر بالله نوێژی لەسەر خوێند و پێنج جار تەکبیری هێنایە سەرزمان.

خەلیفە تائیع لەساڵی ٩٢٩/٣١٧ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو پیاوێکی سپی، چوارشانە و لووتی زل بوو. کەسێکی بەتوانا و پیاوی گۆڕەپان بوو. ناوی دایکی عەتەبە و تا ڕۆژگاری خەلافەتی کوڕەکەی زیندوو بوو. لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی خەلیفە تائیع زانیاری زۆرمان لەبەردەستدا نییە تا بتوانن بەهۆیەوە شارەزای کردەوەکانی بین.

## خەلافەتی قادر بالله

کاتێك خەلیفە تائیع قۆلبەست کرا، بەها ئەلدەولە باسی کەسێك کرا کەشیاوی خەلافەت بێت. هەموان لەسەر خەلافەتی قادر بالله ڕێککەوتن. ئەو، باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی ئیسحاق کوڕی موقتەدر کوڕی موعتەزیدە. دایکی، دایکی مناڵە بەناوی دەمنە. دەستەیەك بەتەمەنی ناوی دەبەن. وەك ئاماژەمان پێدا قادر لەبوتەیحە دەژیا. بەها ئەلدەولە کەسە تایبەتییەکانی خۆی نارده لای تا بۆ وەرگرتنی خەلافەت بیهێننە بەغداد. نێردراوان ڕۆشتنە لای. لەم کاتەدا

دەیلەمییەکان لەبەغداد ئاژاوەیان نایەوەو ڕێگەیان نەدا بەناوی ئەو وتار بخوێندرێتەوە. لەسەر مینبەرەکان وتیان: ئەی خواوەندا، کاروباری بەندە و جێگرەکەی خۆت، قادر باللە سەقامگیر بکە. ناوی ئەویان نەهێنایە سەرزمان. بەها ئەلدەولە ڕەزامەندی ئەوانی بەدەست هێنا.

نێردراوەکان کاتێك گەیشتنە لای قادر باللە کەخەوێکی دەگێڕایەوە کەهەمان شەو بینیبووی. ئەم خەوە، هیبە اللە کوڕی عیسا، دەبیری موهەزیب ئەلدەولە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: حەفتەی دوو جار دەڕۆشتمە لای قادر. ئەو ڕێزی دەگرتن. چەند ڕۆژێك ڕۆشتمە لای قادر، بینیم بەردەوام ئامادەیە، پێشتر ئەوم بەو شێوەیە نەبینیبوو، ڕێزێکی ئەوتۆم هەست پێکرد کەهاوتای نەبینراوە. گومانی جۆراوجۆرم کرد و سەبارەت بەم حاڵەی لێم پرسی تا ئەگەر هەڵەیەك لەمن ڕوویداوە، داوای بەخشین بکەم. قادر باللە وتی: دوێ شەو لەخەودا بینیم ڕووبارەکەی ئێوە، ڕووباری سەلیق فراوان بووە و بۆتە چەند بەرابەری دیجلە. من سەرسوڕماو لای ڕووبارەکە گوزەرم کرد، پردێکی زۆر گەورەم لەسەر ڕووبارەکە بینی. بەخۆم وت: چ کەسێك ئەم پردەی لەسەر ئەم ڕووبارە گەورەدا هەڵبەستووە؟ ڕۆشتمە سەر پردەکە و لەکاتێکدا حەپەساو بووم، پیاوێکم لای خۆم هەست پێکرد. وتی: دەتەوێت لەپردەکە بتپەڕێنمەوە؟ وتم: بەڵێ. دەستی خۆی درێژ کرد و بە من گەیشت، منی گرت و لەپردەکە پەڕاندمییەوە. کارەکەی بەرادەیەك گەورە هاتە بەرچاوم کەترسام. پرسیم: تۆ کێیت؟ وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەم خەلافەتە بەتۆ دەگات و تۆ لەسەر تەختی خەلافەت بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەژیت، چاکە لەگەڵ شوێنکەوتە و منداڵەکانی من بکە.

کاتێك وتەکانی قادر باللە گەیشتە ئێرە، دەنگی خزمەتکار و کەسانی دیکەمان بیست و کاتێك پرسیمان، بینیمان نێردراوەکان هاتنە ژوور تا قادر بۆ وەرگرتنی خەلافەت ببەن.

ئەوم بەسەروەری باوەڕداران ناو برد و دەستی بەیعەتم بۆ درێژ کرد. موهەزیب ئەلدەولە بەباشترین شێوە خزمەتی قادر باللە ی کرد و سامانێکی زۆری لەگەڵ نارد و بەرێی کرد. قادر باللە ڕۆشتە بەغداد و کاتێك گەیشتە جوبەل، بەها ئەلدەولە و

گەورەکانی شار پێشوازییان لێکرد و خزمەتیان کرد. ئەو لەدوانزەی رەمەزان/ بیست و سێی نۆڤەمبەر ڕۆشتە ناو کۆشکی خەلافەت و خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست و لەسیانزەی رەمەزان/ بیست و چواری نۆڤەمبەر بەناوی ئەو وتار خوێندرایەوە. خەلافەت ژیایەوە و پانتاییەکی بەربلاوی داگیر کرد. بەخواستی خواوەند ئاماژەی پێدەدەین. بەشێك لەسامانە تالآن کراوەکانی کۆشکی خەلافەتیان گەڕاندەوە. ئەو دووساڵ و یانزە مانگ لەبوتەیحە ژیا. لەهەموو خوراسان کەس بەناوی ئەو وتاری نەخوێندەوە بەڵکو بەناوی خەلیفە تائیع وتار دەخوێندرایەوە.

## زاڵبوونی خەلەف کوڕی ئەحمەد لەکرمان

لەم ساڵەدا خەلەف کوڕی ئەحمەد، فەرمانڕەوای سیستان و کوڕی، کوری بلنو کچی عەمرۆ کوری لەیسی سەفار، عەمرۆی کوڕی بۆ کرمان ڕەوانە و دەستی بەسەردا گرت.

هۆکاری خەلەف بۆ ئەم کارەی ئەوە بوو کاتێك پێگەی بەرز بوویەوە و سامانێکی زۆری کۆکردەوە، چاوی تەماحی بڕییە داگیر کردنی کرمان بەلآم لەبەر پەیمانی ئاشتی نێوان خۆی و عیزەد ئەلدەولە دەرفەتی ئەم کارەی دەست نەدەکەوت. کاتێك عیزەد ئەلدەولە مرد وشەرەف ئەلدەولە هاتە سەرکار و فەرمانڕەوایەتییەکەی جێگیر و سنووری دەسەلآتەکەی ئارام بوو، خەلەف هیچ جموجۆڵێکی لەخۆی نیشاننەدا تا ئەو کاتەی شەرەف ئەلدەولەیش مرد و فەرمانڕەوایەتی فەرمانڕەواکانی بنەماڵەی بوویە پچڕان و پەرێشانی بەخۆوە بینی و ناسازگاری لەنێوان سەمسام ئەلدەولە و بەها ئەلدەولە هاتە ئاراوە. لەم کاتەدا تەماحی خەلەف بووژایەوە و ئەم هەلەی قۆستەوە و عەمرۆی کوڕی ئامادە و لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ گرتنی کرمان ڕەوانەی کرد.. کرمان لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی تەمورتاشی نوێنەری شەرەف ئەلدەولە بوو. تەمورتاش کاتێك هاتەخۆ کەسوپاکەی عەمرۆ نزیك ببوویەوە. تەنیا رێگە چارەی ئەوان رۆشتن بۆ بەرسیر بوو. ئەوەی توانیان لەگەڵ خۆیان بردیان و ئەوەی مایەوە، عەمرۆ تالآنی کرد و

جگە لەبەردسیر دەستی بەسەر هەموو کرماندا گرت و سامانی خەڵکانی زەوت و باجی کۆکردەوە.

کاتێك سەمسام ئەلدەولە، فەرمانڕەوای فارس، لەم هێرشە ئاگادار بوویەوە، سوپای ئامادە و ڕەوانەی شوێنەکەی تەمورتاشی کرد و باوکی جەعفەری کردە فەرماندەی سوپاکە و فەرمانی پێدا کاتێك تەمورتاش دەبینێت، قۆلبەستی بکات چوونکە گومانی لێدەکرد بەوەی حەز بەسەرکەوتنی براکەی، بەها ئەلدەولە، دەکات. باوکی جەعفەر بەرەو کرمان بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە لای تەمورتاش، ئەوی بۆ شوێنی مانەوەی خۆی بانگ کرد تا ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە و لەم کاتەدا قۆلبەست و ڕەوانەی شیرازی کرد.

کوڕی جەعفەر و سوپاکەی بەرێکەوتن و ڕووبەڕووی سوپاکەی عەمرۆ بوونەوە. دوو سوپا لەدارزین ڕیزیان بەست و ئاگری جەنگیان خۆش کرد. باوکی جەعفەر و دەیلەمییەکان شکستیان خوارد و لەرێگەی جیرۆفت گەڕانەوە.

ئەم هەواڵە بەسەمسام ئەلدەولە و هاوەڵانی گەیشت و بڕیاریاندا سوپایەکی گەورەتر بەفەرماندەیی عەباس کوڕی ئەحمەد ڕەوانەی کرمان بکەن. عەباسیان لەگەڵ سوپایەکی فراوان و توێشوو و کەرەستەی پێویست بۆ ئەو شارە ڕەوانە کرد. عەباس خۆی بەسوپای عەمرۆ گەیاند و لەنزیك سیرجان ڕووبەڕوو بوونەوە و شەڕ دەستپێکرد و دەرئەنجام عەمرۆ کوڕی خەلەف شکستی خوارد و ژمارەیەك لەسەرکردە و سەربازەکان ئەسیر کران. ئەم جەنگە لەموحەرەمی ٣٨٢/مارسی ٩٩٢ زایینی ڕوویدا. عەمرۆ تێککشاو بۆ لای باوکی لەسیستان هەڵات و کاتێك گەیشتە ئەو شارە، باوکی سەرکۆنەی کرد وچەند ڕۆژێك زیندانی کرد و دواتر لەبەردەم خۆی، تەسلیم بەجەلادی کرد و جەلاد خوێنی ڕشت و خۆی جەنازەکەی شۆرد و نوێژی لەسەر خوێند و لەهەمان قەلا بەخاکی سپارد. سوبحان الله ئەم پیاوە بەم هەموو زانست و زانابییەوە چەند دڵبەرد و وەحشی بووە.

سەمسام ئەلدەولە، عەباسی لەکرمان لابرد و ئوستاد هورموزی لەجێگەی ئەو دانیشاند. کاتێك ئەو گەیشتە کرمان، خەلەف کوڕی ئەحمەد لێی ترسا و بۆ سەقامگیر کردنەوەی دووبارەی ئاشتی نامەی بۆ نووسی و لەکردەوەکانی خۆی

داوای بەخشینی کرد. ئاشتی سەقامگیر کرا و خەلەف یەکێك لەقازییەکانی سیستان بەناوی باوکی یوسفی بۆ ئەو ناوچە ڕەوانە کرد. پیاوێکی لەگەڵ قازی نارد و فەرمانی پێدا کاتێك گەیشتنە لای ئوستاد هورموز، باوکی یوسف ژەهر خوارد بکات و بگەڕێتەوە و هەواڵ بێنێت کەئوستاد هورموز، باوکی یوسفی کوشت.

باوکی یوسف ڕۆشتە کرمان و ئوستاد هورموز خواردنی بۆ هێنا. باوکی یوسف خواردی و کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، ئەو پیاوە ژەهر خواردی کرد و باوکی یوسف مرد. ئەو پیاوە سوار لەسەر وشتر بەخێرایی بۆ لای خەلەف گەڕایەوە. خەلەف گەورەکانی شاری کۆکردەوە تا وتەکانی ئەو پیاوە ببیستن. پیاو بەئامادەبوونی هەموان وتی ئوستاد هورموز، باوکی یوسفی کوشت. خەلەف گریا و شینی گێڕا و لەناو خەڵکان دەنگی بەرز کردەوە کە: دەبێت کرمان بگرین و تۆڵەی باوکی یوسف بکەینەوە. خەڵکان کۆبوونەوە. خەلەف ئەوانی لەگەڵ تاهیری کوڕی بۆ کرمان ڕەوانە کرد. ئەوان گەیشتنە نەرماشیر کەئوردووگای دەیلەمییەکان لەوێ بوو. دەیلەمییەکان شکستیان خوارد و نەرماشیر دەستی بەسەردا گیرا.

دەیلەمییەکان ڕۆشتنە جیرۆفت و لەوێ کۆبوونەوە. سوپایەکیان بۆ پارێزگاری کردن لەبەردسیر راسپارد. بەردسیری دایکی شاری کرمان بوو. تاهیر مەبەستی ئەو شارەی کرد و بۆ ماوەی سێ مانگ گەمارۆیدا و بارودۆخی لەدانیشتووانەکەی دژوار کرد. ئەوان نامەیان بۆ ئوستاد هورموز نووسی و لەبارودۆخی خۆیان ئاگاداریان کردەوە و نووسیان ئەگەر فریایان نەکەوێت، شارەکە تەسلیم بەدوژمن دەکەن. ئوستاد هورموز بەخێرایی هەرچی تەواوتر، ڕێگە دژوارەکانی بڕی و خۆی گەیاندە بەردسیر. تاهیر و سوپاکەی هەڵاتن و بۆ سیستان گەڕانەوە. کرمان لەدەستی دەیلەمییەکان مایەوە. ئەم پێشهاتە لەساڵی ٩٩٤/٣٨٤ زایینی ڕوویدا.

## یاخیبوونی بەکجور دژی سەعد ئەلدەولە کوڕی حەمدان و کوژرانی ئەو

کاتێك – ئاماژەمان پێدا – بەکجور لەسوپای میسر لەدیمەشق شکستی خوارد، بۆ ڕقە هەڵات و لەوێ مایەوە و دەستی بەسەر ڕەحبە و کەنارەکانی ڕەقەدا گرت. نامەی بۆ بەها ئەلدەولە کوڕی بویە نووسی تا پەیوەستی بێت، هەروەها نامەیەکی بۆ بازکورد کەدەستی بەسەر دیاربەکر و موسڵدا گرتبوو، نووسی تا بۆ لای ئەو بەرێکەوێت. نامەیەکی بۆ سەعد ئەلدەولە کوڕی حەمدان نووسی و وەك پێشوو ملکەچ بوونی خۆی بۆ فەرمانەکانی ئەو نیشاندا. سەعد ئەلدەولە وەك رابردوو، فەرمانڕەوایەتی حیمسی پێ سپارد. کەس لەوان وەڵامی داواکەی ئەویان نەدایەوە. بەکجور لەڕەقە مایەوە و سەرقاڵی نامەنووسین بۆ ژمارەیەك لەهاوەڵانی لەموالییەکان سەعد ئەلدەولە بوو. ئەوان پەیمانیان لەگەڵ بەست هێرش بکەنە سەر سەرزەمینی سەعد ئەلدەولە و ئاگاداریان کردەوە کەسەعد ئەلدەولە لەجیاتی بەرێوەبردنی کاروباری وڵات، سەرقاڵی رابواردن و مەیٚ بازییە. لەم کاتەدا بەکجور نامەیەکی بۆ عەزیزی میسر نووسی و تەماحی گرتنی حەلەبی خستە بەردەم و ئاگاداری کردەوە کەحەلەب ڕێڕەوی عێراقە و ئەگەر ئەو شارە دەستی بەسەردا بگیرێت، گرتنی شارەکانی دیکە کارێکی ئاسان دەبێت. داوای لەعەزیز کرد بەسوپایەك هاوکاری بکات. عەزیز باللە رازی و بەنەزال، فەرمانڕەوای تەرابلوس و فەرمانڕەوای شارەکانی شام فەرمانیدا، سوپایەك لەگەڵ نەزاڵ بۆ هاوکاری بەکجور ڕەوانە بکەن و لەجەنگ دژی سەعد ئەلدەولە و گرتنی سەرزەمینەکەی، ملکەچی فەرمانەکانی بەکجور بن.

عیسا کوڕی نەستورسی نەسرانی، وەزیری عەزیز باللە، نامەیەکی بۆ نەزال نووسی و فەرمانی پێدا پشتیوانی بەکجور بکات و بۆ هێرش کردنە سەر سەعد ئەلدەولە هانی بدات بەڵام کاتێك جەنگی نێوان ئەوان دەستی پێکرد، خۆی بکشێتەوە.

هۆکاری ئەم کارەی عیسا ئەوە بوو لەنێوان ئەو و بەکجور دوژمنایەتییەکی مەترسیدار ڕەگی داکوتابوو و کاتێك عیسا دوای مەرگی کوڕی کلس، وەزارەتی گرتەدەست، ئەم فەرمانەی بۆ نەزال نووسی کەئاماژەمان پێدا.

کاتێك فەرمانی عەزیز باللە بەنەزال گەیشت بۆ ئەوەی هاوکاری بەکجور بکات، نەزال نامەیەکی بۆ بەکجور نووسی و ئاگاداری کردەوە لەوەی خۆی و سوپاکەی فەرمانی هاوکاری کردنی ئەویان پێدراوە. بەکجور پێی وت: لەفلاَن رۆژ لەرێگەی ڕەققە گوزەر بکە، منیش فلاَن رۆژ لەتەرابلوسەوە بەرێدەکەوم و لەفلاَن رۆژ لەحەلەب یەکتر دەبینین. بەکجور فریوی وتەکانی نەزالی خوارد و رووی کردە بالس. دانیشتووانی بالس رێگەیان لێگرت و ئەو بۆ ماوەی پێنج رۆژ گەمارۆی خستە سەر شارەکە و کاتێك نەیتوانی بیگرێت، بەجێیهێشت.

سەعد ئەلدەولە لەهەواڵی بەرێکەوتنی بەجکور بۆ حەلەب ئاگاداربوویەوە و لەگەڵ لۆلۆی کەبیر، موالی سەیف ئەلدەولەی باوکی، لەحەلەبەوە بەرێکەوت و نامەیەکی بۆ بەکجور نووسی و دڵنەوایی کرد و پێشنیاری ئاشتی و ملکەچ بوونی فەرمانەکانی پێکرد. هەروەها بەڵێنیدا لەڕەققە تا حیمس بەو دەسپێرێت بەلاَم بەکجور رازی نەبوو.

سەعد ئەلدەولە نامەیەکی بۆ فەرمانڕەوای ئەنتاکییە، کە بەنوێنەرایەتی پاشای رۆم فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی دەکرد، نووسی و داوای هاوکای لێکرد. ئەو سوپایەکی گەورەی رۆمییەکانی بۆ هاوکاری سەعد ئەلدەولە نارد. سەعد ئەلدەولە نامەی بۆ عەرەبەکانی هاورێی بەکجور نووسی و بەڵێنی پێدان زەوی و دیاری گرانبایی پێدان. ئەوان پەیوەستی سەعد ئەلدەولە بوون و پەیمانیان بەست لەکاتی دەستپێکردنی جەنگ، رێگەی هەلاَتن بگرنەبەر. دوو سوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەست و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. کاتێك سەربازەکان رووبەرووی یەکبوونەوە، عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر ئوردووگای بەکجور و تالاَنیان کرد و دواتر داوای ئەمانیان لەسەعد ئەلدەولە کرد. بەکجور کاتێك ئەمەی بینی، چوارسەد جەنگاوەری بوێری هەڵبژارد و ویستی هێرش بکاتە سەر خێوەتەکەی سەعد ئەلدەولە. بەخۆی وت یا دەیکوژم، یا دەکوژرێم. دەستبەجێ یەکێك لەهاوەلاَنی هەلاَت و پەیوەستی لۆلۆی کەبیر بوو و ئەوی لەمەبەستەکەی بەکجور ئاگادار کردەوە. لۆلۆی کەبیر داوای لەسەعد ئەلدەولە کرد، شوێنەکەی بەجێبێڵێت بۆ ئەوەی خۆی بڕواتە جێگەکەی ئەو. سەعد ئەلدەولە سەرەتا رازی نەبوو بەلاَم دواتر

شوێنەکەی بەجێهێشت. بەکجور و هاوڕێکانی هێرشیان کرد و دوای شەڕێکی قورس خۆیان گەیاندە لۆلۆی کەبیر. جەنگێکی سەرسوڕهێنەر کەهەموو خەڵکان بەگەورە ناوی دەبەن. کاتێك بەکجور، لۆلۆی کەبیری بینی، گومانی کرد سەعد ئەلدەولەیە و خۆی بۆ هەڵدا و گورزێکی لێدا. لۆلۆ کەوتە سەرزەوی. لەم کاتەدا سەعد ئەلدەولە دەرکەوت و بۆ شوێنەکەی گەڕایەوە. هاوەڵانی سەعد ئەلدەولە شادمان بوون و ورەیان بەرز بوویەوە. دەوری بەکجوریان گرت و بوێرییان لەخۆیان نیشاندا. سەرئەنجام بەکجور وهەموو هاوەڵانی کوژران و بڵاوەیان لێکرد. تەنیا حەوت کەس لای ئەو مایەوە. ئەوانی دیکە یا کوژران یا ئەسیر کران.

کاتێك بارودۆخی بەم شێوەیە بینی، شمشێرەکەی فرێدا و ڕۆشت. ئەسپەکەی لەرێگە لەپێ کەوت. دابەزی و پیادە درێژەی بەرێگەدا. ژمارەیەك لەعەرەبەکان خۆیان پێگەیاند و هەرچی پێبوو، لێیان سەند. ئەو ڕۆشتە لای یەکێك لەعەرەبەکان و خۆی پێناساند و بەڵێنیدا ئەگەر بیباتە ڕەققە، یەك وشتر زێری پێدەدات. عەرەبەکە بەوتەکانی رازی نەبوو و ئەوی لەماڵەکەی گرت و ڕۆشتە لای سەعد ئەلدەولە و لەگرتنی بەکجور ئاگاداری کردەوە. سەعد ئەلدەولە بەپیاوی عەرەبی وت: چی دەخوازیت داوا بکە. ئەو دووسەد فەدان[٩] زەوی و سەد هەزار درهەم و سەد باری وشتر گەنم و پەنجا دەست جل و بەرگی ویست. سەعد ئەلدەولە زیاتر لەمەی پێدا و دەستەیەکی لەگەڵ نارد و بەکجوریان گرت و بردیانە لای سەعد ئەلدەولە. سەعد ئەلدەولە، کاتێك ئەوی بینی، فەرمانیدا خوێنی برێژن. بەکجور کوژرا و دەرئەنجامی ناسپاسی کردنی خۆی وەرگرت.

کاتێك سەعد ئەلدەولە، بەکجوری کوشت، رێگەی ڕەققەی گرتەبەر و کەوتە گیانی خەڵکی ئەو شارە. سەلامەی ڕەشیقی لەگەڵ مناڵەکانی بەکجور و باوکی حەسەن عەلی کوڕی حسەینی مەغربی، وەزیری بەکجور، لەڕەققە بوون. ئەوان شارەکەیان بەسەعد ئەلدەولە سپارد و ئەمان و پەیمانی بەهێزیان بۆ مناڵەکانی بەکجور و سامانی ئەوان و مەغربی وەزیر و سەلامەی ڕەشیقی و سامانەکانیان

---

[٩]– فەدان: بەرابەرە لەگەڵ چوارسەد قامیشی چوارگۆشە. لەکۆندا بۆ پێوانی زەوییەکان، قامیشی درێژ بەدرێژایی دوو گەز بەکار دەبرا. وەرگێر

وەرگرت. کاتێك منداڵەکانی بەکجور لەگەڵ سامانەکەیان شارەکەیان بەجێهێشت، سەعد ئەلدەولە سامانەکەی بینی و بەزۆری زانی.

لەم کاتەدا قازی کوڕی باوکی حەسین لای سەعد ئەلدەولە بوو. سەعد ئەلدەولە پێی وت: گومانم نەدەکرد بەکجور ئەم سامانەی هەبێت. قازی پێی وت: بۆ لێیان ناسێنیت؟ ئەو هەرچی هەیە، هی تۆیە، چوونکە بەندە ناتوانێت خاوەنی هیچ شتێك بێت (بەکجور بەندە بوو). ئەگەر ئەو کارە بکەیت، نەگوناحت کردووە، نەپەیمانت شکاندووە. سەعد ئەلدەولە کاتێك ئەم وتەی بیست، دەستی بەسەر سامانەکەدا گرت و ئەوانی قۆڵبەست کرد. مەغربی وەزیر بۆ حەرەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەڵات. منداڵەکانی بەکجور پەیکیان بۆ لای عەزیز باللە نارد تا نێوەنجیگەری بکات. عەزیز پەیکی بۆ نێوەنجیگەری نارد و فەرمانی بەسەعد ئەلدەولەدا ئەوان ڕەوانەی میسر بکات. هەڕەشەی کرد ئەگەر ئەوان بۆ میسر نەکات، بەڵایەکی گەورەی بەسەردا دێنێت. سەعد ئەلدەولە جوێنی بەنێردراوەکەدا و وتی: بەسەروەرت بڵێ، هێرشی دەکەمەسەر. پێشەنگەکانی سوپاکەی بۆ حیمس نارد تا خۆیشی پەیوەستیان بێت.

## مەرگی سەعد ئەلدەولە کوڕی حەمدان

کاتێك سەعد ئەلدەولە ئامادەی ڕۆشتن بۆ دیمەشق بوو، نەخۆشی قۆلنج بەرۆکی گرت و بۆ حەلەب گەڕایەوە تا خۆی چارەسەر بکات. نەخۆشییەکەی چارەسەر و باش بوویەوە و ویستی بۆ ئوردووگاکەی بگەڕێتەوە. ئەو ڕۆشتە لای یەکێك لەکەنیزەکانی. ئەوی لەئامێز گرتبوو کەلەناکاو کەوت و نیوەی جەستەی لەکار کەوت. پزیشکیان هێنا. پزیشك پێی وت: دەستت بدە بەمن تا لێدانی دەمارەکانت بگرم. ئەو دەستی چەپی خۆی هێنایە پێش. پزیشك وتی: دەستی ڕاستی خۆت بێنە پێش. سەعد ئەلدەولە وتی: شکاندنی سوێند، دەستی ڕاستی بۆ نەهێشتووم. مەبەست ئەوەیە پەیمان شکێنی ئەو لەگەڵ منداڵەکانی بەکجور بووە هۆی مەرگی ئەو کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. سەعد ئەلدەولە لەکردەوەکانی خۆی پەشیمان بوویەوە بەڵام چیتر پەشیمانی دادی نەدەدا. سەعد ئەلدەولە سێ ڕۆژ بەم شێوە ژیا و دوای ئەوەی

کوڕەکەی باوکی فەزایلی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد، مرد و داوای لەلۆلۆی کەبیر کرد سەرپەرەستی و چاودێری بنەماڵەکەی بکات.

دوای ئەوەی سەعد ئەلدەولە مرد، کورەکەی، باوکی فەزایل، جێگەی گرتەوە و لۆلۆی کەبیری لەسوپاییەکان سوێندی وەفاداری بۆ وەرگرت و سەربازەکان بۆ حەلەب گەڕانەوە.

باوکی حەسەنی مەغربی وەزیر لەحەرەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە بەرەو میسر بەرێکەوت و تەماحی گرتنی حەلەبی خستە بەردەم عەزیز باللە. ئەو سوپایەکی بەفەرماندەیی مەنجوتەکین، یەکێك لەسەرکردەکانی، بۆ حەلەب ڕەوانە کرد. مەنجوتەکین لەگەڵ سوپایەکی گەورە خۆی گەیاندە حەلەب و گەمارۆی خستەسەر. باوی فەزایل و لۆلۆی کەبیر لەحەلەب بوون. نامەیەکیان بۆ بەسیل نووسی و داوای هاوکارییان لێکرد. بەسیل سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ بولغارەکان بوو. نامەیەکی بۆ نوێنەری خۆی لەئەنتاکییە نووسی و فەرمانی پێدا هاوکاری باوکی فەزایل بکات. ئەو لەگەڵ پەنجا هەزار سەربازی ڕۆمی بەرێکەوت تا خۆی گەیاندە پردی تازە دروست کراوی عاسی. مەنجوتەکین کاتێك لەهاتنی ئەم سوپایە ئاگادار بوویەوە، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان ئەسپی غاردا تا پێش باوکی فەزایل لەگەڵ ئەوان بجەنگێت و سەرکوتیان بکات. ئەو لەپردی عاسی گوزەری کرد و ڕووبەڕووی ڕۆمییەکان بوویەوە و شکستی پێهێنان. ڕۆمییەکان بۆ ئەنتاکییە گەڕانەوە و ژمارەیەکی زۆریان کوژران.

مەنجوتەکین ڕۆشتە ئەنتاکیە و ئەو شارە و گوندەکانی دەوروبەری تالآن کرد و سووتاندی. لەلای باوکی فەزایل تا ئەو جێگەی دەیتوانی خواردەمەنی و ئالیکی لەگوندەکانی دەوروبەر کۆکردەوە و بردییە شارەکە و ئەوەی مایەوە، سووتاندی تا زیانی لەسوپای میسر دابێت. مەنجوتەکین بۆ حەلەب گەڕایەوە و گەمارۆی خستەسەر. لۆلۆ پارەی بۆ باوکی حەسەنی مەغربی نارد و داوای لێکرد مەنجوتەکین لەحەلەب بگەڕێنێتەوە چوونکە لەو ساڵەدا بەدەست هێنانی خواردەمەنی دژوار ببوو. ئەم پێشنیارە پەسەند کرا و مەنجوتەکین کە لەجەنگ بێزار و شەکەت ببوو، ڕێگەی دیمەشقی گرتەبەر.

کاتێك عەزیز باللە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، توڕە و نامەیەکی بۆ سوپا نووسی تا بۆ حەلەب بگەڕێتەوە. مەغربی لەشارەکەی دوورخستەوە و لەرێگەی دەریا بۆ

تەرابلوس و لەوێوە بۆ ئۆردووگای سوپاییەکان خواردەمەنی و توێشووی پێویستی ڕەوانە کرد. سوپای میسر دووبارە گەمارۆی خستە سەر حەلەب و سیانزە مانگ لەوێ مانەوە. توێشووی حەلەب کەمی کرد.

باوکی فەزایل، دووبارە نامەی بۆ پاشای ڕۆم نووسی و داوای هاوکاری کرد و پێی وت ئەگەر حەلەب دەستی بەسەردا بگیرێت، ئەنتاکییەش داگیر دەکرێت و بارودۆخ بۆ تۆ دژوار دەبێت. پاشای ڕۆم لەم کاتەدا گەیشتبووە ناوەڕاستی وڵاتی بولغارەکان. ئەو بەخێرایی گەڕایەوە و لەوەرزی بەهار، ڕێگەی حەلەبی گرتەبەر. سوپای میسر پەیکیان بۆ لای مەنجوتەکین نارد و لەم بارودۆخە ئاگاداریان کردەوە. سیخوڕەکانیشی ئەم هەواڵەیان پێگەیاند. مەنجوتەکین، هەرچی گەرماو و بازار و بینا کەلەکاتی گەمارۆکە دروستی کردبوو، وێرانی کرد و تێکشکاو حەلەبی بەجێهێشت. پاشای ڕۆم گەیشت و لەنزیك دەروازەی حەلەب ئۆردووی لێدا. باوکی فەزایل و لۆلۆی کەبیر ڕۆشتنە لای و بۆ حەلەب گەڕانەوە. بەسیل ڕێگەی شامی گرتەبەر و دەستی بەسەر حیمس و شیزردا گرت و تالانی کرد. دواتر ڕێگەی تەرابلوسی گرتەبەر. دانیشتووانی ئەو شارە خۆڕاگرییان کرد. بەسیل چل و چەند ڕۆژ لەو کەنارە مایەوە و کاتێك لەسەرکەوتن بێ هیوا بوو، ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڕۆمی گرتەبەر.

ئەم ڕوداوە بۆ عەزیز باللە گران و دژوار بوو. ئەو بۆ جەنگی ڕۆمییەکان دروشمی جیهادی لەناو خەڵکان بەرز کردەوە و ویستی لەقاهیرە بەرێکەوێت بەڵام نەخۆشی بەرۆکی گرت و بەهۆی ئەم نەخۆشییە مرد. بەخواستی خواوەند دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

### بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا مەنسور، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، نوێنەری خۆی، یوسفی لەو دیارە لابرد و باوکی عەبدولله محەممەد کوڕی باوکی عەرەبی لەجێگەی ئەودانا.

لەم ساڵەدا جەوهەری فەرماندە، دوای دوورخرانەوەی لەکار، مرد. جەوهەر ئەو کەسەیە میسری بۆ مۆعێزی عەلەوی گرت.

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، وەزیرەکەی باوکی نەسر شاپوری لەئەهواز گرت و باوکی قاسم عەبد عەزیز کوڕی یوسفی وەك وەزیر هەڵبژارد.

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە دوای گەڕانەوەی لەخوزستان، باوکی نەسر خواشازە و باوکی عەبدوللە کوڕی تاهیری گرت چوونکە باوکی نەسر پیاوێکی دەست وشك بوو و هاوکاری کەسی نەدەکرد و بەکوڕی موعەلیم (هەمەکارەی بەها ئەلدەولە) بەشێوەی پێویست خزمەتی نەدەکرد و دیاری بۆ نەدەنارد. کوڕی موعەلیم هەوڵەکانی بۆ گرتنی ئەو دەستپێکرد.

لەم ساڵەدا فولادی زەماندار لەدەستی سەمسام ئەلدەولە بۆ ڕەی هەڵات. هۆکاری هەڵاتنەکەی ئەمە بوو: بەرادەیەك تەنگی بەسەمسام ئەلدەولە هەڵچنی کەسەمسام ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و ویستی بیگرێت بەڵام فولاد ئاگادار بوویەوە و هەڵات.

لەم ساڵەدا خەڵکی ڕەحبە نامەیان بۆ بەها ئەلدەولە نووسی و داوایان لێکرد کەسێك بۆ شارەکەیان بنێرێت تارەحبەی پێ بسپێرن. ئەو خەمارتەکینی حەفسی بۆ ڕەحبە نارد. ئەو دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و هێرشی کردە سەر ڕەقە. ڕەققە لەم کاتەدا لەژێر فەرمانی بەدر، کۆیلەی سەعد ئەلدەولە کوڕی حەمدان بوو. چەندین جەنگ لەنێوان ئەوان ڕوویدا و خەمارتەکین نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. لەم کاتەدا لەناسازگارییەکانی بەغداد ئاگادار بوویەوە و ڕێگەی ئەو شارەی گرتەبەر. لەرێگە، دەستەیەك لەعەرەبەکان ڕێگەیان لێ گرت و گرتیان. ئەو بەدانی سامانێکی زۆر خۆی لەدەستی ئەوان ڕزگار کرد.

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە ، بۆ قادر باللە سوێندی وەفاداری و بەجێهێنانی پەیمانی خوارد. قادریش سوێندی دڵپاکی و چاکەکاری خوارد و شایەتیدا لەدەرەوەی کۆشکی خەلافەت هەموو کارەکان لەدەستی بەها ئەلدەولەدایە.

لەم ساڵەدا ئاژاوە لەناو دانیشتووانی بەغداد سەری هەڵدا و شکۆی فەرمانڕەوایەتی لەناوچوو. ئاگر کەوتە ناو گەڕەکەکان و خراپەکاری دەستی پێکرد.

لەم ساڵەدا قازی قازییەکان، عوبەیداللە کوڕی ئەحمەد کوڕی مەعروف باوکی محەممەد مرد. ئەو لەساڵی ٩١٨/٣٠٦ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. پیاوێکی فرەزان، داوێن پاك و خۆپارێز بوو. شوێنکەوتەی موعتەزلەکانە. محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەلی کوڕی عاسم کوڕی ڕازانی ئەبوبەکر ناسراو بەکوڕی موقری ئیسفەهانی کەراوی موسنەدی باوکی یەعلی موسڵی بوو، لەم ساڵە و لەتەمەنی نەوەد وشەش ساڵی مرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و دووی کۆچی( ٩٩٢و٩٩٣ زایینی )

## گەڕانەوەی دەیلەمییەکان بۆ موسڵ

بەها ئەلدەولە، باوکی جەعفەر حەجاج کوڕی هورموزی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ موسڵ نارد و ئەو موسڵی لەساڵی ٩٩١/٣٨١ زایینی گرت. هۆزی مناڵەکانی عوقەیل و فەرمانڕەواکەیان، باوکی زەواد محەممەد کوڕی موسەییب، بۆ جەنگ دژی ئەو بڕیاریاندا و لەنێوان ئەم دوو سوپا چەندین جەنگ ڕوویدا. باوکی جەعفەر لەم جەنگانەدا بوێری لەخۆی نیشاندا تا ئەو جێگەی لەنێوان دوو ڕیزی سوپاکە تەختێکی دادەنا و دادەنیشت و عەرەبەکان لێی دەترسان. باوکی جەعفەر داوای سوپایەکی لەبەها ئەلدەولە کرد. بەها ئەلدەولە، باوکی قاسم عەلی کوڕی ئەحمەدی وەزیری بۆ هاوکاری ئەو نارد و باوکی قاسم لەسەرەتای ساڵ ڕێگەی موسڵی گرتەبەر. کاتێك باوکی قاسم گەیشتە ئوردووگا، بەها ئەلدەولە نامەیەکی بۆ باوکی جەعفەر نووسی تا قۆڵبەستی بکات. باوکی جەعفەر زانی ئەگەر قۆڵبەستی بکات، ناسازگاری لەناو سوپاکەی سەرهەڵدەدات و عەرەبەکان سەرکەوتن بەدەست دێنن. لەبەر ئەمە سەرپێچی فەرمانەکەی بەها ئەلدەولەی کرد.

هۆکاری فەرمانەکەی بەها ئەلدەولە ئەوە بوو کوڕی موعەلیم ڕقی باوکی قاسمی لەدڵ گرتبوو و لای بەها ئەلدەولە خراپەی ئەوی دەهێنایە سەرزمان. بەها ئەلدەولە، فەرمانی گرتنی ئەوی دەرکرد. بەها ئەلدەولە، بەهەموو وتەکان ڕازی دەبوو و بەکاری دەبردن. وەزیر لەم پیلانە ئاگادار بوویەوە و گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵ باوکی زەواد دەست پێکرد و چەندین بارمتەی لێسەند و بۆ بەغداد گەڕایەوە. سوپاکەی داوایان لێکرد پەیوەستی باوکی زەواد بێت بەڵام ئەو کارەی نەکرد و کاتێك گەیشتە بەغداد، ئاگادار بوویەوە کەکوڕی موعەلیم قۆڵبەست و دواتر کوژراوە و خراپەکارییەکانی کۆتایی پێهاتووە.

کاتێك هەواڵی گیران و کوژرانی کوڕی موعەلیم، بەورزەیر گەیشت، نیشانەی خەمباری لەروخساری دەرکەوت. کەسانی دەوروبەر پێیان وت: ئەم خەمەی تۆ

بۆچییە مەگەر نەئەوەی لەخراپەکارییەکانی ئەو ئاسوودە بوویت؟ وەزیر وتی: ئەگەر فەرمانڕەوایەکی وەك بەها ئەلدەولە بۆ هاوکاری، کەسێکی وەك کوڕی موعەلیم لەخۆی نزیك دەکاتەوە و دواتر بەو شێوەیە لەناوی دەبات، دەبێت لەهاونشینی ئەو بترسین.

بەها ، شەریف باوکی ئەحمەدی موسەوی وەك پەیك بۆ لای باوکی زەواد نارد بەڵام عەرەبەکان گرتیان و دواتر ئازادیان کرد. ئەو ڕێگەی موسڵ و دواتر بەغدادی گرتەبەر.

## چۆنیەتی سپاردنی خەلیفە تائیع بەخەلیفە قادر و چۆنیەتی هەڵس وکەوتی لەگەڵ ئەو

لەرەجەب/ سێپتامبەری ئەم ساڵە بەها ئەلدەولە، خەلیفە تائیعی بەقادر باللە سپارد. خەلیفە قادر ئەوی لەیەکێك لەژوورەکانی خۆی دانا و یەکێك لەخزمەتکارە بڕواپێکراوەکانی خۆی راسپارد نیازەکانی دابین و خزمەتی بکات. خەلیفە تائیع هاوشێوەی رۆژگاری خۆی، ئەوەی دەیویست، داوای دەکرد و خزمەتکار، دەیخستە بەردەستی.

دەگێڕنەوە خەلیفە قادر پزیشکێکی بۆ لای نارد. تائیع باللە وتی: ئەمە ئەو پزیشکەیە باوکی عەباس (قادر باللە) چارەسەر دەکات؟ وتیان: بەڵێ. وتی: پێی بڵێن لەفلانە شوێن هەنگوینم داناوە، کەمێکی بۆ من بنێرێت و ئەوەی دیکەی بۆ خۆی هەڵگرێت. ئەو کارەی کرد.

رۆژێك خەلیفە قادر، نیسکی بۆ نارد. تائیع باللە پرسی: ئەمە چییە؟ وتیان: نیسك و گەڵای چەوەندەر. وتی: ئایا باوکی عەباس لێی خواردووە؟ وتیان: بەڵێ. وتی: لەمنەوە پێی بڵێن: ئەگەر دەتویست نیسك بخۆیت، بۆخۆت شاردەوە؟ ئەگەر پێویستت بەم نیسکە بوو بۆ لەسەر تەختی خەلافەت دانیشتیت؟ لەم کاتەدا خەلیفە قادر فەرمانیدا کەنیزێکی بۆ دابین بکەن تا خواردنی تایبەتی خۆی بۆ دروست بکات. ژیانی تائیع بەم شێوەیە درێژەی کێشا تا مرد.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، باوکی حەسەن کوڕی موعەلیمی، کەبەسەر هەموو کار وکەسەکان تەنانەت وەزارەتیش زاڵبوو، قۆڵبەست کرد. باوکی حەسەن بەرادەیەك لەگەڵ خەڵکان بەخراپی هەڵس وکەوتی دەکرد کەدەنگی نارەزایی سوپاییەکان بەرز بوویەوە و سکالأیان لێکرد و داوایان لەبەها ئەلدەولە کرد، باوکی حەسەن بەوان بسپێرێت. بەها ئەلدەولە ئەوانی ئارام کردەوە و بەڵێنی پێدان دەستی ئەو لەکاروبارەکان کورت دەکاتەوە بەلأم سوپاییەکان رازی نەبوون. بەها ئەلدەولە بەناچاری خۆی و هەموو هاوەلأنی ئەوی گرت بەو گومانەی سوپاییەکان دەگەڕێنەوە بەلأم نەگەڕانەوە. باوکی حەسەنی بەوان سپارد. سوپاییەکان دووجار ژەهر خواردیان کرد بەلأم نەمرد، سەرئەنجام ئەویان خنکاند و بەخاکیان سپارد.

لەشەوال/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە شۆڕش و ئاژاوە لەنێوان دانیشتووانی کەرخ و خەڵکانی دیکە سەری هەڵدایەوە. باوکی فەتح محەممەد کوڕی حەسەنی پەردەدار سوار ئەسپەکەی بوو و کوشتاری خەڵکی دەست پێکرد و ئارامی بۆ شارەکە گەڕاندەوە.

لەم ساڵەدا لەبەغداد نرخی شتومەك بەرز بوویەوە و بەهای نیو ڕەتڵ نان گەیشتە چل درهەم.

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، وەزیرەکەی، باوکی قاسم عەلی کوڕی ئەحمەدی گرت چوونکە گومانی لێکرد بۆ لەناو بردنی کوڕی موعەلیم نامەی بۆ سوپاییەکان نووسیوە. ئەو باوکی نەسر شاپور و باوکی مەنسور کوڕی ساڵحان، هەردووکیانی وەك وەزیر هەڵبژارد.

لەم ساڵەدا سەمسام ئەلدەولە، وەزیرەکەی باوکی قاسم عەلا کوڕی حەسەنی شیرازی گرت. ئەو کاروباری سەمسام ئەلدەولەی بەرێوەدەبرد. ئەو تا ساڵی ٩٩٣/٣٨٣ زایینی لەزینداان مایەوە تا ئەوەی سەمسام ئەلدەولە لەزینداان هێنایەدەر و دووبارە پێگەی وەزیری پێبەخشییەوە. لەم دەورانەدا باوکی قاسمی مودەلجی کاروبارەکانی بەرێوە دەبرد.

لەم ساڵەدا پاشای رۆم ڕۆشتە ناو ئەرمەنیيە و خەلات، مەلازكەرد و ئەرجيشی گەمارۆدا. خەڵك ورەی خۆيان لەدەستدا. دواتر باوكی عەلی حەسەن كوڕی مەروان بۆ ماوەی بيست ساڵ پەيمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و پاشای رۆم بۆ سەرزەمينی خۆی گەڕايەوە.

لەشەوال/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ئەمير باوكی فەزڵ كوڕی خەليفە قادر چاوی بەدنيا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا بوغراخانی ئيلەك، خاقانی توركەكان، لەگەڵ سوپاكەی هێرشی كردە سەر بوخارا و ئەمير نوح كوڕی مەنسور سوپايەكی گەورەی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو نارد. ئيلەك رووبەرووی ئەم سوپايە بوويەوە و سەركوتی كرد. سوپاكەی نوح بۆ بوخارا گەڕايەوە و ئيلەك شوێنيان كەوت. نوح لەگەڵ سەربازەكانی هاتەدەر و جەنگێكی قورسی لەگەڵ سوپای ئيلەك دەستپێكرد. دەرئەنجامی ئەم جەنگە بەشكستی ئيلەك كۆتايی هات و ئيلەك بەرەو بەلاساغون، پايتەختەكەی خۆی هەڵات.

لەم ساڵەدا باوكی عەمرۆ و محەممەد كوڕی عەباس كوڕی حەسنەوييەی خەزاز، مردن. محەممەد كوڕی عەباس لەساڵی ٢٩٥/٩٠٧ زايينی چاوی بەدنيا هەڵهێنا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و سێی کۆچی(٩٩٣و٩٩٤ زایینی)

## یاخیبوونی مناڵەکانی بەختیار

لەم ساڵەدا مناڵەکانی بەختیار لەزیندان هاتنەدەر و دەستیان بەسەر ئەو قەڵایە گرت کەتیایدا زیندانی بوون.

چۆنیەتی زیندانی بوونی ئەوان بەم شێوە بوو: شەرەف ئەلدەولە دوای باوکی خۆی، عیزەد ئەلدەولە، چاکەی لەگەڵ دەکردن و ئەوانی لەزیندان هێنایەدەر و لەشیراز نیشتەجێی کردن و چەندین پارچە زەوی خستە بەردەستیان. کاتێک شەرەف ئەلدەولە مرد، ئەوان لەقەڵایەك لەفارس زیندانی کران. ئەوان لەگەڵ زیندانوانەکەی خۆیان و دەیلەمییەکانی دیکە بەنەرمی هەڵس وکەوتیان کرد و ئەو کەسانە، مناڵەکانی بەختیاریان لەزیندان هێنایەدەر و بۆ لای خەڵکی ئەو دەوروبەرە ڕەوانەیان کردن. زۆربەی ئەو خەڵکە پیادە بوون. مناڵەکانی بەختیار پیادەکانیان لەو قەڵایە کۆکردەوە.

سەمسام ئەلدەولە لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە و باوکی عەلی کوڕی ئوستاد هورموزی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کرد. کاتێك ئەم سوپایە لەمناڵەکانی بەختیار نزیك بوویەوە، ئەوان کەژمارەیان شەش کەس بوو، لەگەڵ دەیلەمییەکانی هاوڕێیان لەو قەڵایە پەنایان گرت. باوکی عەلی گەمارۆی خستە سەریان و نامەی بۆ یەکێك لەسەرکردەکانی دەیلەم نووسی و تەماحی وەرگرتنی خەڵات و دیاری خستە بەردەم. ئەو سەرکردەیە بەشێوەیەکی نهێنی ئەوانی بردە ناو قەڵاکە. سوپاکەی باوکی عەلی دەستیان بەسەر قەڵاکەدا گرت و مناڵەکانی بەختیاریان ئەسیر کرد. سەمسام ئەلدەولە فەرمانیدا دووان لەوان بکوژن و ئەوانی دیکەیان زیندانی بکەن. ئەو کارەیان کرد.

## زاڵبوونی سەمسام ئەلدەولە لەخوزستان

لەم ساڵەدا سەمسام ئەلدەولە دەستی بەسەر خوزستاندا گرت.

چۆنیەتی شکانی پەیمانی ئاشتی بەم شێوە بوو: بەها ئەلدەولە، باوکی عەلا عەبدوللە کوڕی فەزلی بۆ ئەهواز نارد و فەرمانی پێدا بۆ ڕۆشتن بۆ فارس خۆی ئامادە بکات و ئاگاداری کردەوە کەلەم لاولا سوپاییەکان بۆ هاوکاری ئەو دەنێرێت و کاتێك سوپاییەکان بەتەواوی کۆبوونەوە، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هێرش بکاتە سەر فارس بەشێوەیەك کاتێك سەمسام ئەلدەولە ئاگادار ببێتەوە کەدوژمن لەناو سەرزەمینەکەی خۆیدا ببینێت.

باوکی عەلا بێ ئەوەی هێزە هاوکارییەکانی بەها ئەلدەولە ئامادە ببێت، بەرێکەوت و ئەم هەواڵە بڵاو بوویەوە. سەمسام ئەلدەولە سوپاکەی خۆی ڕازاندەوە و بەرەو خوزستان ڕەوانەی کردن. باوکی عەلا هەواڵەکەی بۆ بەها ئەلدەولە نارد و داوای هێزی هاوکاری کرد. بەها ئەلدەولە سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری ئەو نارد. سوپای فارس گەیشتە گوڕەپان و باوکی عەلا رووبەروویان بوویەوە بەڵام لەگەڵ سوپاکەی شکستی خوارد و خۆی ئەسیر کرا. ئەویان بردە لای سەمسام ئەلدەولە. سەمسام ئەلدەولە، جل و بەرگی ڕەنگینی لەبەر کرد و بەشارەکەدا گەڕاندی بەڵام دایکی سەمسام ئەلدەولە نێوەنجیگەری کرد و نەیهێشت بیکوژێت. ئەویان خستە زیندان.

ئاگادار بوون لەم ڕووداوانە، بەها ئەلدەولەی پەرێشان و نیگەران کرد. لەلایەکی دیکە گەنجینەکانی هیچی تیا نەمابوو لەبەر ئەمە وەزیرەکەی، نەسر کوڕی شاپوری بۆ واست نارد بۆ ئەوەی سامانی بۆ کۆبکاتەوە و چەندین گەوهەری گرانبایی لەگەڵ نارد تا وەك ئەمانەت لای موهەزیب ئەلدەولە دایبنێت و لەبەرابەردا قەرزێکی گەورەی لێ وەربگرێت. کاتێك باوکی نەسر گەیشتە واست، ڕۆشتە لای موهەزیب ئەلدەولە و گەوهەرەکانی دانا. ئەو بەپێی ئەم گەوهەرانە قەرزی بۆ بەها ئەلدەولە نارد.

## زاڵبوونی تورکەکان لەبوخارا

لەم ساڵەدا شەهاب ئەلدەولە هارون کوڕی سلێمانی ئیلەك، ناسراو بەبوغراخانی تورك، دەستی بەسەر بوخارادا گرت. سەرزەمینی کاشغەر و بلاساغون، تا سنوری چین لەژێر فەرمانی ئەودا بوو.

پاڵنەری بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کاتێك باوکی حەسەن کوڕی سیمجور مرد وکوڕەکەی باوکی عەلی جڵەوی کاروباری خوراسانی گرتەدەست، نامەی بۆ ئەمیر نوح کوڕی مەنسور نووسی و داوای لێکرد فەرمانڕەوایەتی سنوورەکانی باوکی بەو بسپێرێت. ئەمیر نوح رازی وخەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بۆ نارد. باوکی عەلی دڵنیا بوو ئەم خەڵاتە بۆ ئەوە بەڵام کاتێك نێردراو گەیشتە رێگەی هەرات، رێگەی بۆ ئەو سەرزەمینە گۆڕی و خەڵات و فەرمانڕەوایی خوراسانی بەفائیق، فەرمانڕەوای هەرات بەخشی. باوکی عەلی زانی فێڵیان لێکردووە و ئەمە بەڵگەیەك بوو بۆ ئەوەی ئەوان خراپەخوازی ئەون. فائیق خەڵاتەکەی وەرگرت و لەهەراتەوە هێرشی کردە سەر باوکی عەلی. باوکی عەلی ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ ژمارەیەکی هەڵبژێردراو لەهاوەڵانی رووبەرووی بوویەوە. دووری رێگەی بەڕادەیەك بەخێرایی بڕی کەپێش هەواڵی بەرێکەوتنی کەوت و لەنێوان بوشەنج و هەرات رووبەرووی فائیق بوویەوە. فائیق و سوپاکەی شکستیان خوارد و بەرەو مەروروود هەڵاتن.

باوکی عەلی دووبارە نامەی بۆ ئەمیر نوح نووسی و فەرمانڕەوایەتی خوراسانی داوا کرد. ئەمیر نوح رازی و هەموو سەرزەمینی خوراسانی خستە ژێر فەرمانی ئەو بەڵام هەراتی بۆ فائیق هێشتەوە. باوکی عەلی سەرکەتوو بۆ نەیشابور گەڕایەوە و باجی خوراسانی کۆکردەوە. نوح نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێکرد بەشێکی باجی بۆ بنێرێت تا بۆ خەرجی سوپاکەی تەرخانی بکات. باوکی عەلی داوای بەخشینی کرد و باجی نەنارد چوونکە لەدەرئەنجامی ئەم کارە دەترسا. نامەیەکی بۆ بوغراخان نووسی و هانیدا بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر بوخارا و تەماحی ئەو کارەی خستە بەردەم. سەرئەنجام لەسەر ئەوە رێککەوتن بوغراخان دەست بەسەر هەموو ماوەرائەلنەهردا بگرێت و باوکی عەلی فەرمانڕەوایەتی خوراسان بکات. بوخراخان تەماحی گرتنی بوخارای کرد و دووبارە هێرشی کردە سەر ئەو شارە.

فائیق تا ئەو کاتەی هێزی بەدەست هێنایەوە، لەمەروروذ مایەوە. سوپاکەی لەدەوری کۆبوونەوە و بێ مۆڵەت هێرشی کردە سەر بوخارا. ئەمیر نوح گومانی لەکارەکەی کرد و سوپایەکی بۆ ئەو شارە نارد و فەرمانیدا رێگە لەفائیق بگرن. کاتێك سوپاکەی نوح گەیشت، رووبەرووی سوپاکەی فائیق بوونەوە و سوپاکەی فائیق شکستیان خوارد و فائیق گەڕایەوە و مەبەستی گرتنی تەرموزی کرد. ئەمیر نوح فەرمانی بۆ باوکی حەرس ئەحمەد کوڕی محەممەدی فەریغونی (فەرمانڕەوای جوزجان) نووسی و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر فائیق. باوکی حەرس سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و هێرشی کردە سەر فائیق. فائیق رووبەرووی ئەم سوپایە بوویەوە و شکستی پێهێنان و سامانەکانی تالآن کرد.

فائیق نامەیەکی بۆ بوغراخان نووسی و تەماحی گرتنی بوخارای خستە بەردەم. بوغراخان هێرشی کردە سەر بوخارا و مەبەستی سەرزەمینی سامانییەکانی کرد و کەم کەم دەستی بەسەر بەشەکانی ئەو سەرزەمینەدا دەگرت. نوح سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و ئەنج، یەکێك لەسوپاسالارەکانی خۆی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد. بوغراخان رووبەرووی ئەم سوپایە بوویەوە وشکستی پێهێنان و ئەنج و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی دیکەی ئەسیر کرد. بوغراخان کاتێك شکستی بەم سوپایە هێنا، تەماحی گرتنی شارەکانی دیکەی کرد. نوح و سوپاکەی لاواز بوون. ئەمیر نوح نامەیەکی بۆ عەلی کوڕی سیمجور نووسی و داوای لێکرد و فەرمانی پێدا سوپایەك بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە بکات. عەلی کوڕی سیمجور وەڵامی نەدایەوە وتەماحی گرتنی خوراسانی کرد.

بوغراخان هێرشی کردە سەر بوخارا، فائیق سەردانی کرد و بوو بەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی ئەو. ئەوان ڕۆشتنە بوخارا. ئەمیر نوح خۆی شاردەوە و بوغراخان دەستی بەسەر بوخارادا گرت و لەوێ دابەزی. نوح بەشێوەیەکی نهێنی شارەکەی بەجێهێشت و لەرووباری ئامول پەڕییەوە و لەوێ نیشتەجێ بوو. سوپاکەی لەوێ پەیوەستی بوون و ژمارەیەکی فراوان لەدەوری کۆبوونەوە و لەو شوێنەدا ئوردوویان لێدا.

نوح بەردەوام نامەی بۆ باوکی عەلی سیمجور دەنارد و داوای هاوکاری دەکرد

بەڵام باوکی عەلی وەڵامی نەدەدایەوە. فائیق لەبوغراخان داوای مۆڵەتی کرد تا هێرش بکاتە سەر بەڵخ و داگیری بکات. بوغراخان مۆڵەتی پێدا و فائیق هێرشی کردە سەر ئەوشارە و ئەو شارەی بۆ خۆی هەڵبژارد.

## گەڕانەوەی نوح بۆ بوخارا و مەرگی بوغراخان

کاتێك بوغراخان لەبوخارا ئوردووی لێدا، نەیتوانی شادمان بێت و نەخۆشی بەرۆکی گرت. ئەو لەبوخاراوە ڕۆشتە تورکستان. کاتێك بوغراخان، بوخارای بەجێهێشت، دانیشتووانەکەی هێرشیان کردە سەر سوپاییەکان و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و تالأن کارییان کردە پیشە. تورکانی غوزیش، بۆ بەدەست هێنانی تالأنی و کوشتاری سوپاکەی بوغراخان، شان بەشانی خەڵکان دەستیان بۆ شمشێر برد.

بوغراخان کاتێك لەبوخارا دوور کەوتەوە، مرد. ئەمیر نوح کاتێك بیستی بوغراخان بوخارای بەجێهێشتووە، لەگەڵ سوپاکەی ڕێگەی بوخارای گرتەبەر و ڕۆشتە ناو شارەکە و دووبارە سنووری خۆی و سنووری دەسەلأتی باوکانی بەدەست هێنایەوە و خەڵکەکەی شادمان بوون و ئەمیر نوحیان بەکەسێکی پیرۆز دەزانی.

کاتێك بوغراخان مرد، سوپاکەی بۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. ئەو پیاوێکی دیندار، چاکەکار، دادپەروەر و خۆش کردار بوو. زانا و پیاوە ئایینییەکانی خۆش دەویست و ڕێزی دەگرتن و حەزی دەکرد لەزمانی ئەو، بنووسن: بەندەی رسول الله، صلی الله علیە و سلم. ئەو فەرمانڕەوایەتی تورکستانی دوای خۆی بەئیلەك خان سپارد.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا دەیلەمییەکان دژی بەها ئەلدەولە ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و ماڵی باوکی نەسر کوڕی شاپوری وەزیریان تالآن کرد. باوکی نەسر خۆی شاردەوە. کوڕی ساڵحانیش لەوەی بەتەنیا وەزیر بێت، دەستی لەکار کێشایەوە و باوکی قاسم عەلی کوڕی ئەحمەد وەك وەزیر دەستنیشان کرا بەڵام ئەویش هەڵات و شاپور دوای هێور بوونەوەی دەیلەمییەکان بۆ وەزارەت گەڕایەوە.

لەم ساڵەدا خەلیفە قادر باللە دوای گەڕانەوەی خەڵکی خوراسان لەمەککە، خوانێکی گشتی ڕێکخست و سەبارەت بەخوێندنەوەی وتار بەناوی خۆی گفتوگۆی لەگەڵ کردن. ئەوانیش پەیامی ئەویان بۆ فەرمانڕەوای خوراسان برد.

لەم ساڵەدا کچی بەها ئەلدەولەیان بەمارەیی سەد هەزار دینار لەخەلیفە قادر مارە کرد. ئەم پەیمانی هاوسەرگیرییە لەبەردەم بەها ئەلدەولە و نەقیب باوکی ئەحمەد حسەین کوڕی موسا، باوکی سەیید ڕەزی ئەنجام درا بەڵام کچەکە پێش ئەوەی بڕواتە ماڵی خەلیفە، مرد.

لەم ساڵەدا لەعێراق گرانی دەرکەوت و بەهای یەك کیسە ئارد بۆ دووسەد و شەست درهەم و یەك کوڕ گەنم بۆ شەش هەزار و شەشسەد درهەمی غیاسی بەرز بوویەوە.

لەم ساڵەدا باوکی نەسر شاپور کوڕی ئەردەشێر لەبەغداد، قوتابخانەیەکی دروست کرد و کتێبێکی زۆری بۆ تەرخان کرد تا موسوڵمانان سوودی لێ ببینن.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن عەلی کوڕی محەممەد کوڕی سەهلی ماسەرجەسی، فەقیهی شافعی و شێخ باوکی تەییبی تەبەری و ئەبوبەکر محەممەد کوڕی عەباسی خوارەزمی وتاردەر و باوکی تالیب عەبدسەلام کوڕی حەسەنی مەئمونی لەمناڵەکانی مەئمون مردن. مەرگی شێخ باوکی تەییبی تەبەری لەنەیشابور ڕوویدا.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و چواری کۆچی (٩٩٤و٩٩٥ زایینی)

### فەرمانڕەوای مەحمود کوڕی سەبوکتەکین لەخوراسان و دوور خرانەوەی باوکی عەلی لەو سەرزەمینە

لەم ساڵەدا ئەمیر نوح، مەحمود کوڕی سەبوکتەکینی وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەستنیشان کرد.

هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك نوح بۆ بوخارا گەڕایەوە -ئاماژەمان پێدا- سەبارەت بەباوکی عەلی و هاوکاری نەکردنی ئەو لەکاتی پێویست، پەشیمان بوویەوە.

کاتێك نوح لەبوخارا سەقامگیر بوو، فائیق بیری لەوە کردەوە بەرەو بوخارا بەڕێکەوێت و فەرمانڕەوایەتی شارەکە بگرێتەدەست. بۆ ئەم مەبەستە لەبەلْخەوە هێرشی کردە سەر بوخارا و کاتێك نوح ئاگادار بوویەوە، سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد تا ڕێگەی پێشڕەوی لێ بگرن. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و جەنگێکی قورس ڕوویدا و دەرئەنجام فائیق و سوپاکەی شکستیان خوارد و پەیوەستی باوکی عەلی بوون. باوکی عەلی بەهاتنی ئەوان شادمان و دڵگەرم بوو. باوکی عەلی و فائیق بڕیاریاندا پێکەوە دژی نوح شۆڕش بکەن. کاتێك شۆڕشەکەی خۆیان ئاشکرا کرد، ئەمیر نوح، نامەیەکی بۆ سەبوکتەکین نووسی (لەو کاتەدا لەغەزنە بوو) و ئەوی لەم بارودۆخە ئاگادار کردەوە و فەرمانی پێدا بۆهاوکاری کردنی بەڕێکەوێت. ئەمیر نوح، سەبوکتەکینی وەك فەرمانڕەوای خوراسان دیاریکرد.

سەبوکتەکین لەم بگرە و بێنەدا سەرقاڵی جیهاد بوو و گرنگی بەڕووداوەکانی نێوان بوخارا و خوراسان نەدەدا. کاتێك نێردە و نامەکەی نوحی بەدەست گەیشت، وەڵامی داواکەی نوحی دایەوە و ملی ڕێگەی گرتەبەر و لای نوح جێگیر بوو. سەبوکتەکین بۆ غەزنە گەڕایەوە و سوپای ئامادە کرد. کاتێك باوکی عەلی و فائیق لەم هەواڵە ئاگادار بوونەوە، نامەیان بۆ فەخر ئەلدەولە کوڕی بویە نووسی و داوای هاوکارییان کرد. باوکی عەلی و فائیق داوای سەربازیان لەفەخر ئەلدەولە

کرد. فەخر ئەلدەولە رازی و سوپایەکی گەورەی بۆ هاوکاری کردنی ئەوان ڕەوانە کرد. وەزیری فەخر ئەلدەولە، ساحەب کوڕی عیباد، فەخر ئەلدەولەی بۆ ئەم کارە هاندا.

سەبوکتەکین لەگەڵ کوڕەکەی مەحمود، لەغەزنەوە بەرەو خوراسان بەڕێکەوتن. نوح و سەبوکتەکین پەیوەستی یەك بوون و مەبەستی لەناو بردنی باوکی عەلی و فائیقیان کرد و لەکەنارەکانی هەرات ڕووبەڕووی سوپاکەی ئەوان بوونەوە. لەم بگرە و بێنەدا دارا کوڕی قابوس کوڕی وەشمگیر لەگەڵ هاوەڵانی لەسوپاکەی باوکی عەلی جیابوونەوە و پەیوەستی نوح بوون و بەم شێوەیە سوپاکەی باوکی عەلی شڵەژا و سوپاکەی سەبوکتەکین شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ ئەسیر کردن و کوشتار و تالأنییان دەست پێکرد. باوکی عەلی و فائیق بۆ نەیشابور گەڕانەوە و سەبوکتەکین و نوح لەدەرەوەی هەرات وچانیان گرت و دواتر ڕێگەی نەیشابوریان گرتەبەر. کاتێك باوکی عەلی و فائیق لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوونەوە، ڕێگەی جورجانیان گرتەبەر و فەخر ئەلدەولەیان لەبارودۆخی خۆیان ئاگادار کردەوە. فەخر ئەلدەولە سامان و دیاری بۆ ناردن و لەجورجان جێگەی کردنەوە.

نوح دەستی بەسەر نەیشابوردا گرت و مەحمود کوڕی سەبوکتەکین وەك فەرمانڕەوای ئەو دیارە و سوپای خوراسان دەستنیشان کرد و نازناوی سەیف ئەلدەولەی پێبەخشی. نازناوی ناسر ئەلدەولەی بەباوکی بەخشی و هەردووك چاکەکارییان گرتەبەر. نوح بۆ بوخارا و سەبوکتەکین بۆ هەرات گەڕایەوە و مەحمود لەنەیشابور نیشتەجێ بوو.

## دووبارە گرتنەوەی ئەهواز بەدەستی بەها ئەلدەولە

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە دووبارە دەستی بەسەر ئەهوازدا گرتەوە.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: بەها ئەلدەولە سوپایەکی حەوتسەد کەسی بۆ ئەهواز نارد و توغانی تورکی وەك فەرماندەی ئەوان دەستنیشان کرد. کاتێك ئەوان گەیشتنە شوش، هاوەڵانی سەمسام ئەلدەولە ئەو ناوچەیان بەجێهێشت. سەربازەکانی بەها ئەلدەولە ڕۆشتنە ناو شارەکە و لەکەنارەکانی خوزستان بڵاو بوونەوە. زۆرینەی ئەوان تورك بوون. ناوبانگیان لەدەیلەمییەکان زیاتر بڵاوبوویەوە. سەمسام ئەلدەولە لەگەڵ سوپاکەی خۆی کەدەیلەمی بوون یا لەمناڵەکانی تەمیم یا لەمناڵەکانی ئەسەد، بەرەو ئەهواز بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە شووشتەر، شەوانە ڕێگەی بڕی تا سەربازە تورکەکانی بەها ئەلدەولە سەرکوت بکات. ڕێنیشاندەرەکان ڕێگەیان ون کرد و لەوان دوور کەوتنەوە و پێشەنگەکانی سوپای تورك ئەوانیان بینی و سوپایبەان لەهێرشی ئەوان ئاگادار و وشیار بوونەوە. تورکەکان کۆبوونەوە و ڕیزیان بەست و فەرماندەی ئەوان، توغان، بۆسەی نایەوە. کاتێك دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، سەربازی ناو بۆسەکان، هێرشیان کردە سەر دەیلەمییەکان و شکستی ئەوانی لێکەوتەوە. سەمسام ئەلدەولە و دەستەیەك لەهاوەڵانی ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. ژمارەی هاوەڵانی سەمسام ئەلدەولە لەکاتی هەڵاتن، هەزار کەس بوو. نزیکەی دوو هەزار کەس لەوان داوای ئەمانیان کرد. تورکەکان تالآنی زۆریان دەستکەوت.

توغان بۆ ئەمان بەخشراوەکان خێوەتەکانی هەڵدا تا نیشتەجێیان بکات. کاتێك ئەوان لەناو خێوەتەکان نیشتەجێ بوون، تورکەکان ڕاوێژیان کرد و وتیان: ژمارەی ئەمان بەخشراوەکان زیاتر لەئێمەیە و لەشۆڕشی ئەوان دەترسین. بڕیاری کوشتنی ئەوانیاندا. دەیلەمییەکان کاتێك هاتنەخۆ کەخێوەتەکانیان بەسەردا ڕووخا و تورکەکان بەئاسنی خێوەتەکان کەوتنە گیانی دەیلەمییەکان و ئەوانیان کوشتار کرد.

بەها ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە. ئەو لەواست بوو. ئەو کەقەرزی لەموهەزیب ئەلدەولە وەرگرتبوو، کاتێك ئەم هەواڵی بیست، ڕێگەی ئەهوازی گرتەبەر بەڵام توغان و تورکەکان پێش هاتنی ئەو دەستیان بەسەر ئەودیارەدا گرتبوو.

سەمسام ئەلدەولە ڕەشی پۆشی و ڕێگەی شیرازی گرتەبەر و ڕۆشتە ناو شارەکە. دایکی لەڕەش پۆشینی ئەو شڵەژا. سەمسام ئەلدەولە خۆی ئامادە کرد تا لەخوزستان پەیوەستی بەها ئەلدەولەی برای بێت.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا پەیمانی هاوسەرگیری موهەزیب ئەلدەولە و کچی بەها ئەلدەولە و ئەمیر مەنسور کوڕی بویە کوڕی بەها ئەلدەولە لەگەڵ کچی موهەزیب ئەلدەولە، بەسترا. مارەیی هەرکام دووسەد هەزار دینار بوو.

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، باوکی نەسر خواشازەی گرت.

لەم ساڵەدا حاجییەکان لەسەعلەبە گەڕانەوە و کەس لەعێراق و شام نەڕۆشتە مەککە. هۆکاری گەڕانەوەی ئەوان ئەمە بوو ئوسەیفەر، ئەمیری عەرەب، ڕێگەی لێگرتن و بەشێوەیەکی توند لەگەڵیان ئاخاوت و وتی: ئەو درهەمانەی سوڵتان ساڵی پار ناردوویەتی، ڕووکەشەکەیان زیو بووە و من بەئەندازەی ئەوەم دەوێت. نامە نووسین لەمبارەوە درێژەی کێشا و بارودۆخی حاجییەکان دژوار و بەناچاری گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا باوکی قاسم نەقیبی زێنەبی مرد ودوای ئەو کوڕەکەی جێگەی گرتەوە.

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن نەهرسابسی، سەرپەرەستی پزیشکەکانی گرتەئەستۆ و باوکی ئەحمەدی موسەوی لەو کارە دوورخرایەوە. دوو کوڕەکەی ئەو مورتەزا و ڕەزی وەك جێگری باوکیان هەژمار دەکران.

لەم ساڵەدا عەبدولله کوڕی محەممەد کوڕی نافیع کوڕی موکەرەم باوکی عەباسی بۆستی خۆپارێز مرد. ئەو پیادە لەنەیشابورەوە بەرەو ماڵی خوا بەرێکەوت و بۆ

ماوەی حەفتا ساڵ نەپشتی بەدیوارەوەدا نە پشتی. عەلی کوڕی حسەین کوڕی حەمویە کوڕی زەید باوکی حسەینی سۆق لەم ساڵەدا مرد. ئەو حەدیسی بیستبوو و حەدیسی دەوت، هاونشینی باوکی خەیر ئەقتەع و کەسانی دیکە بوو. عەلی کوڕی عیسا کوڕی عەلی کوڕی عەبدوللە باوکی حەسەن، نەحوی بەناو عەرەبی، ناسراو بەڕەمای کە لەساڵی ٩٠٨/٢٩٦ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەکوڕی دورەید وکەسانی دیکە حەدیسی دەگێڕایەوە و تەفسیرێکی گەورەی نووسیوە، لەم ساڵەدا مرد. محەممەد کوڕی عەباس کوڕی ئەحمەد کوڕی قەزاز باوکی حەسەن لەم ساڵەدا مرد. ئەو زۆری بیست و زۆری نووسی و نووسراوەکانی ئەو بەڵگەی راستی و زانایی ئەوە. باوکی عوبەیداللە محەممەد کوڕی عیمرانی مەرزوبانی و موحسن کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی باوکی فەهم باوکی عەلی تەنوخی قازی، هەردووک لەم ساڵەدا مردن. موحسن لەساڵی ٩٣٨/٣٢٧ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. پیاوێکی فرەزان بوو.

لەم ساڵەدا باوکی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی هیلالی سابی، نووسەری ناودار، لەنەوەد و یەك ساڵی کۆچی دوایی کرد. ئەو بەردەوام نەخۆش و نەدار بوو.

لەم ساڵەدا خراپەکاران لەبەغداد دووبارە دەرکەوتنەوە و لەنێوان دانیشتووانی کەرخ و دەروازەی بەسرە ئاژاوە روویدا و ژمارەیەکی زۆر لەگەڕەکەکان سووتان. دواتر هەردووك سازی سازگارییان ژەنی.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و پێنجی کۆچی ( ٩٩٥ زایینی )

## گەڕانەوەی باوکی عەلی بۆ خوراسان

کاتێک ئەمیر نوح بۆ بوخارا گەڕایەوە و سەبوکتەکین بۆ هەرات و مەحمود لەنەیشابور مایەوە، باوکی عەلی و فائیق چاوی تەماحیان بڕییە خوراسان و لەرەبیع الاوەل/ ئاوریل لەجورجانەوە هێرشیان کردە سەر نەیشابور. کاتێک ئەم هەواڵە بەمەحمود گەیشت، باوکی ئاگادار کردەوە و خۆی بەرێکەوت و لەدەرەوەی نەیشابور ئوردووی لێدا و چاوەڕوانی هێزە پشتیوانەکان بوو. باوکی عەلی وفائیق خێراییان لەخۆیان نیشاندا و مەحمود خۆڕاگری. ژمارەی سوپاکەی مەحمود کەم بوو، بەناچاری لەبەرابەر سوپای ئەوان بۆ لای باوکی هەڵات و سوپاکەی باوکی عەلی و فائیق تالآنییەکانیان کۆکردەوە. کەسانی نزیک لەباوکی عەلی داوایان لێکرد شوێنپێی مەحمود هەڵبگرێت و تا باوکی سەرقاڵی کۆکردنەوەی هێزە، ئەو لەناو ببات بەڵام باوکی عەلی ئەو کارەی نەکرد و لەنەیشابور مایەوە و نامەیەکی بۆ ئەمیر نوح نووسی و لەکردەوکانی خۆی پەشیمانی دەربڕی و بۆ هەڵەکانی داوای بەخشینی کرد. نامەیەکی لەو شێوەی بۆ سەبوکتەکین نووسی و گوناحی ئەو ڕووداوەی خستە ئەستۆی فائیق. بەڵام کەس لەو دووانە گرنگییان بەنامەکەی نەدا.

سەبوکتەکین سوپای ڕازاندەوە و سەربازەکان سوار لەسەر هەرچوارپێیەک پەیوەستی بوون. ئەو هێرشی کردە سەر باوکی عەلی و لەجومادی الاخرە/ جولای لەتوس بەیەک گەیشتن و ئەو ڕۆژەیان بەجەنگەوە بەسەر برد. مەحمود کوڕی سەبوکتەکین لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەپشتەوە هات و سوپاکەی باوکی عەلی و فائیق شکستیان خوارد و ژمارەیەکی بەرچاو لەسەربازەکانیان کوژران. باوکی عەلی و فائیق ڕزگار بوون و ڕێگەی ئەبیوەردیان گرتەبەر. سەبوکتەکین شوێنیان کەوت و مەحمودی لەنەیشابور هێشتەوە. باوکی عەلی و فائیق لەئەبیوەردەوە بەرەو مەرو و لەوێوە بەرەو ڕووباری ئامول هەڵاتن. نامەیان بۆ ئەمیر نوح نووسی

وریزیان گرت. ئەو بەومەرجە لەباوکی عەلی خۆش بوو کە لەفائیق جیا ببێتەوە و بڕواتە جەرجانییە (ناوی گوندێکە لەسەرزەمینی خوارەزم). باوکی عەلی ئەو کارەی کرد. فائیق ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت و لەفریوی ئەوان ئاگاداری کردەوە بەلاَم باوکی عەلی گرنگی بەوتەکانی نەدا. ئەو لەفائیق جیابوویەوە و ڕێگەی جەرجانییەی گرتەبەر و لەئاوەدانییەکی نزیك خوارەزم بەناوی هەزار ئەسپ، ئوردووی لێدا. باوکی عەبدوللە، خوارەزمشا کەسی بۆ لای نارد تا میوانداری بکات و پەیامی بۆ نارد کەسەردانی دەکات. باوکی عەلی دڵخۆش بوو.

لەشەودا، خوارەزم شا دەستەیەك لەسەربازەکانی بۆ لای باوکی عەلی نارد و گەمارۆی خستنەسەر و لەرەمەزان/ سێپتامبەری ئەم ساڵە قۆلبەستیان کردن. خوارەزمشا لەیەکێك لەماڵەکانی خۆی زیندانی کرد وشوێن هاوەلاَنی کەوت. گەورەکانی ئەوانی گرت و پاشماوەکان هەلاَتن.

فائیق ڕۆشتە لای ئیلەك خان لەماوەرائەلنەهر. ئیلەك ڕێزی گرت و بەڵێنی پێدا ئەو بۆ سنوورەکەی دەگەڕێنێتەوە.نامەیەکی بۆ نوح نووسی وسەبارەت بەفائیق نێوەنجیگەری کردوداوای لەنوح کرد فەرمانڕەوایەتی سەمەرقەندی پێ بسپێرێت. نوح رازی بوو و فائیق لەسەمەرقەند مایەوە.

## چۆنیەتی رزگاری باوکی عەلی و کوژرانی خوارەزمشا

کاتێك باوکی عەلی ئەسیر کرا، هەواڵی گیرانی ئەو بەمەئمون کوڕی محەممەد فەرمانڕەوای جەرجانییە گەیشت و پەرێشان و خەمبار بوو. سوپای کۆکردەوە و هێرشی کردە خوارەزمشا و لەکاس گوزەری کرد. کاس شاری خوارەزمشا بوو. مەئمون گەمارۆی خستە سەر شارەکە و شەڕی لەگەڵ دانیشتووانەکەی کرد و بەزۆر شارەکەی داگیر کرد. سەربازەکان، باوکی عەبدوللە خوارەزمشایان ئەسیر کرد و باوکی عەلیان لەزیندان هێنایەدەر و بۆ جەرجانییە گەڕانەوە. مەئمون یەکێك لەهاوەلاَنی وەك نوێنەری خۆی لەخوارەزمشا بەجێهێشت و خوارەزم پەیوەستی سنووری ئەو بوو. مەئمون خوارەزمشای بردە بارەگاکەی خۆی و لەبەرچاوی باوکی عەلی کوڕی سیمجور خوێنی ڕشت.

## قۆڵبەست کران و مەرگی باوکی عەلی کوڕی سیمجور

کاتێك باوکی عەلی کوڕی سیمجور لای مەئمون کوڕی محەممەد لەجەرجانییە مایەوە، مەئمون نامەیەکی بۆ ئەمیر نوح نووسی و بوو بەنێوەنجیگەر و داوای لەنوح کرد لەگوناحەکەی باوکی عەلی خۆش ببێت. نوح رازی بوو و فەرمانیدا باوکی عەلی رێگەی بوخارا بگرێتەبەر. باوکی عەلی لەگەڵ کەسان و هاوەڵانی بەرەو ئەو شارە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتنە بوخارا، سەرکردە و سوپاسالارەکان لەلەبەرابەر ئەوان دەرکەوتن. کاتێك گەیشتنە بارەگای نوح، ئەمیر فەرمانی قۆڵبەست کردن و زیندانی کردنی ئەوانیدا.

سەبوکتەکین ئاگادار بوویەوە کەکوڕی عوزەیز، وەزیری ئەمیر نوح، بۆ رزگار کردنی باوکی عەلی هەوڵ دەدات. پەیکی بۆ لای کوڕی عوزەیز نارد و داوای باوکی عەلی کرد و ئەوی خستە زیندان تا ئەوەی لەساڵی ٩٩٧/٣٨٧ زایینی لەزیندان مرد. ئەمە دەرئەنجامی ژیانی باوکی عەلی کوڕی سیمجور و بنەماڵەکەی لەسزای نافەرمانی کردن بوو.

کوڕی باوکی عەلی، باوکی حەسەن پێش ئەم رووداوانە، پەیوەستی فەخر ئەلدەولە کوڕی بویە بوو. فەخر ئەلدەولە رێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. ئەو بەنهێنی و لەبەر هەوەس، رێگەی خوراسانی گرتەبەر و گومانی کرد کەس هەستی پێناکات. بەڵام پەردە لەسەر کارەکەی هەڵگیرا و ئەسیر کرا و لای باوکی عەلی زیندانی کرا.

باوکی قاسم، برای باوکی عەلی، ماوەیەك لەناو سوپاکەی سەبوکتەکیندا بوو، دواتر بەشێوەیەکی لەناکاو نافەرمانی کردە پیشە و رێگەی نەیشابوری گرتەبەر بەڵام بەمەبەستەکەی نەگەیشت و مەحمود کوڕی سەبوتەکین هێرشی کردەسەر. ئەو لەدەست سوپاکەی مەحمود هەڵات و مەبەستی پەیوەست بوون بەفخر ئەلدەولەی کرد و لای ئەو مایەوە. بەخواستی خواوەند، پاشماوەی بەسەرهاتی ئەو لەساڵەکانی داهاتوودا باس دەکەین.

## چۆنیەتی مەرگی ساحەب کوڕی عیباد

لەمساڵەدا ساحەب باوکی قاسم ئیسماعیل کوڕی عیباد، وەزیری فەخر ئەلدەولە، لەڕەی کۆچی دوایی کرد. ئەو یەکێك لەزاناکان، فرەزانەکان، چارەسەرکەران، چاکەکاران و بەخشەرانی رۆژگاری خۆی بوو. شارەزای چەندین زانست و نامەکانی کۆکراوەتەوە و بەناوبانگە. بەرادەیەك کتێبی کۆکردبوویەوە کەوێنەی نییە. دەڵێن بۆ گواستنەوەی کتێبەکانی پێویستی بەچوارسەد وشتر بوو.

کاتێك ساحەب مرد، فەخر ئەلدەولە ، باوکی عەباس ئەحمەد کوڕی ئیبراهیمی زەبیی ناسراو بەکافی وەك وەزیر هەڵبژارد.

کاتێك ساحەب لەمەرگی خۆی دڵنیابوو، بەفەخر ئەلدەولەی وت: من هەموو توانای خۆم بۆخزمەتی تۆ بەکار برد و رێگەیەکم گرتەبەر کەنازناوی چاکەی بۆ تۆ لێ کەوتەوە، هەنووکە ئەگەر کاروبارەکان وەك پێشوو بەرێوە ببەیت، هەموان ئەم ناوبانگە بۆ تۆ دەگەڕێننەوە و من رزگارم دەبێت و ئەگەر خۆت لەو شێوازە بەدوور بگریت و خراپەکاری بۆ تۆ دەگێڕنەوە و لەبەر فەرمانڕەوایەتی کردن، سەرکۆنەت دەکەن. ئەمە وەسیەتی بۆ فەخر ئەلدەولە بوو.

کاتێك ساحەب مرد، فەخر ئەلدەولە چەند کەسێکی نارد تا چاودێری سامان و دارایی ساحەب بکەن و ئەوەی تایبەت بەو بوو، دەستی بەسەردا بگرن. قێزەون بێت خزمەت بەفەرمانڕەواکان کەبەم شێوەیە پاداشتی خێرخوازانی خۆیان دەدەنەوە، چ بگات بەکەسانی دیکە.

جەنازەی ساحەبیان بردە ئیسفەهان. چەند فراوانە جیاوازی کردەوەکانی فەخر ئەلدەولە لەگەڵ کوڕی عیباد و عەزیز باللە عەلەوی لەگەڵ وەزیرەکەی، یەعقوب کوڕی کلس- بەو شێوەی ئاماژەی پێدرا.

ساحەب کوڕی عیباد ئەو کاتەی زیندوو بوو، چاکەی زۆری لەگەڵ قازی عەبدجەبار کوڕی ئەحمەدی موعتەزلی کرد وپێگەیەکی بەرزی پێبەخشیبوو. کاروباری داوەری ڕەی وکەنارەکانی ئەو شارەی پێسپارد. کاتێك ساحەب مرد، عەبدجەبار وتی: دڵسۆزی بۆ ئەو ڕەوا نییە چوونکە مرد بێ ئەوەی تۆبە بکات و تۆبەکەی ئاشکرا بکات. بەم شیوەیە عەبدجەبار بەناپیاوی ناوی دەرکرد.

دواتر فەخر ئەلدەولە، عەبدجەباری گرت و سامانەکەی لێسەند. لەو سامانەی

لەعەبدجەباری سەند، هەزار دەست جل و بەرگ و هەزار پەشمینەی پەشمی گرانبایی دەبینرا کەفەخر ئەلدەولە، فرۆشتی. ئەی بۆ عەبدجەبار بیری لەخۆی نەکردەوە ولەپاشەکەوت کردنی ئەم هەموو سامانە ناڕەوایە، تۆبەی نەکرد!؟

دواتر فەخر ئەلدەولە، هاوەڵان و شوێنکەوتەکانی ساحەب کوڕی عیبادی گرت و هەرجۆرە سازانێك کەساحەب ئەنجامی دابوو، هەڵوەشایەوە و لەگەڵ وەزیرەکانی لەهەموو ناوچەکانی وڵات، فەرمانی زەوت کردنی سامانەکانی دەرکرد و بەم شێوەیە سامانێکی زۆری کۆکردەوە کەماوەیەك دوای مەرگی پەرژو بڵاو بوویەوە وجگە لەقورسایی گوناح و ناوزڕان هیچی بۆ نەمایەوە.

## هێرشی سەمسام ئەلدەولە بۆ سەر تورکەکان

لەم ساڵەدا سەمسام ئەلدەولە فەرمانیدا تورکەکانی نیشتەجێی فارس کوشتار بکەن. دەستەیەك لەوانیان کوشت و ئەوانی دیکە هەڵاتن و لەهەموو ناوچەکان خراپەکارییان کردە پیشە و ڕۆشتنە کرمان و لەوێوە ڕێگەی سندیان گرتەبەر و داوای مۆڵەتی ڕۆشتنە ناو وڵاتیان لە فەرمانڕەوای ئەو دیارە کرد. فەرمانڕەوا مۆڵەتی پێدان و سەردانی کردن. هاوەڵانی فەرمانڕەوا ڕازی بوون بەوەی سەرکوتیان بکەن. کاتێك فەرمانڕەوا سەردانی کردن، سوپاکەی خۆی کردە دوو ریز و کاتێك تورکەکان لەناو ئەواندا جێگیر بوون، سوپای فەرمانڕەوا هێرشی کردنەسەر و شمشێریان خستە ناویان. جگە لەدەستەیەکی بریندار کەس ڕزگاری نەبوو. ئەوانیش خۆیان خستە ناو کوژراوەکان و کاتێك تاریکی باڵی بەسەر هەموو ناوچەیەك کێشا، هەڵاتن.

## چۆنیەتی مەرگی خواشازە

لەم ساڵەدا باوکی نەسر خواشازە لەبەتائیح کۆچی دوایی کرد. ئەو دوای گیرانی بۆ ئەم دیارە هەڵات. بەها ئەلدەولە، فەخر ئەلدەولە، سەمسام ئەلدەولە و بەدر کوڕی حەسنەوییە هەرکام نامەیان بۆ نووسی و پێشنیاریان پێکرد بڕواتە لایان و بەڵێنی دابین کردنی نیاز و خواستەکانیان پێدا. فەخر ئەلدەولە نووسی: ئەگەری هەیە بەو خزمەتانەی بەعێزەد ئەلدەولەت کردووە، بەدگومان بیت، ئێمە

هەرگیز سەبارەت بەفەرمانبەری کردنی کەسێك کەپێگەی تۆی بەرز کردەوە و تۆ چاکەخوازی ئەو بوویت، لێپێچینەوەت لەگەڵ ناکەین. تۆ دەزانی من چۆن هەڵس وکەوتم لەگەڵ ساحەب کوڕی عیباد کرد و ئەوەی لەگەڵ ئێمەی کرد، لەبەرچاوم نەگرت. خواشارە بەخوێندنەوەی ئەم نامە مەبەستی ڕۆشتن بۆ دەرباری فەخر ئەلدەولەی کرد بەڵام پێش گەیشتن، فریشتەی مەرگ تەنگی پێهەڵچنی. ئەو یەکێك لەگەورە سەرکردەکانی عێزەد ئەلدەولە بوو.

## گەڕانەوەی سوپای سەمسام ئەلدەولە بۆ ئەهواز

لەم ساڵەدا سەمسام ئەلدەولە، سوپایەکی لەدەیلەمییەکان ڕازاندەوە و لەگەڵ عەلا کوڕی حەسەن، ڕەوانەی ئەهوازی کردن. بەرێکەوت، توغان، نوێنەری بەها ئەلدەولە لەئەهواز مرد و تورکەکانی هاوڕێی بڕیاریاندا بۆ بەغداد بگەڕێنەوە. کەسێك ئەم هەواڵەی بۆ بەها ئەلدەولە نارد. ئەم هەواڵە بووە هۆی پەرێشان بوون و نیگەران بوونی بەها ئەلدەولە. ئەو کالیجاری مەرزوبان کوڕی شەهفیروزی وەك نوێنەری خۆی بۆ ئەهواز نارد و باوکی محەممەد حەسەن کوڕی موکەرەمی بۆ لای فەتکین ڕەوانە کرد. فەتکین لەسوپاکەی سەمسام ئەلدەولە هەڵاتبوو و لەرامهورموز ژیانی بەسەر دەبرد. بەها ئەلدەولە، داوای لەفەتکین کرد لەشوێنەکەی بمێنێتەوە بەڵام ئەو کارەی نەکرد وبۆ ئەهواز گەڕایەوە و نامەی بۆ باوکی محەممەد کوڕی موکەرەم نووسی تا کاروبارەکانی رامهورموز بەرێوە ببات. بەها ئەلدەولە دوای ئەوان ڕێگەی خوزستانی گرتەبەر. عەلا نامەی بۆ نووسی و نەرمی نواند و فریویدا.

دواتر عەلا لەرێگەی رووباری موسرقانەوە گەیشتە خان تەوق و لەنێوان ئەو و باوکی محەممەد کوڕی موکەڕەم و فەتکین جەنگ روویدا و دەیلەمییەکان ڕۆشتنە ناو باخەکان و پێشڕەوییان کرد و ڕۆشتنە ناوشارەکە. شارەکە لەدەستی کوڕی موکەرەم و فەتکیندا نەما. ئەم دوانە نامەیان بۆ بەها ئەلدەولە نووسی و داوایان لێکرد بڕواتە لایان. بەها ئەلدەولە بەڵێنی پێدان بەڵام کەمتەرخەمی کرد و هەشتا کۆیلەی تورکی بۆ لای ئەو دوانە نارد. ئەم تورکانە لەپشتەوە هێرشیان کردە سەر دەیلەمییەکان. دەیلەمییەکان ڕێگەیان بۆ کردنەوە و کاتێك کەوتنە ناویان،

شمشێریان دەرکێشا و تورکەکانیان کوشتار کرد.

کاتێک بەها ئەلدەولە لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، ورەی خۆی دۆڕاند و بێ ئەوەی لای کەس باسی بکات، مەبەستی گەڕانەوەی کرد. فەرمانیدا ئەسپەکان زین بکەن و کەرەستەی جەنگ هەڵگرن. فەرمانەکەی بەجێهێنرا. بەشێکی ڕێگەی ئەهوازی بڕی، بەڵام بۆ بەسرە گەڕایەوە و لەدەرەوەی شارەکە ئوردووی لێدا. کاتێک کوڕی موکەڕەم لەبارودۆخی بەها ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە، بۆ عەسکەر موکەڕەم گەڕایەوە. عەلا و دەیلەمییەکان شوێنی کەوتن و لەو کەنارانە دووریان کردەوە. ئەو و سوپاکەی لەرامەلأن، لەنێوان عەسکەر مەکەرەم و شوشتەر دابەزین. جەنگ و شەڕ چەند جارێك لەنێوان ئەم دوو سوپایە ڕوویدا.

لەشووشتەر تا رامهورموز لەدەست هاوەڵە تورکەکانی بەها ئەلدەولەدا بوو و لەوێوە تا ئەرجان لەژێر فەرمانی دەیلەمییەکان. تورکەکان شەش مانگ لەو کەنارانە مانەوە و دواتر بۆ ئەهواز گەڕانەوە. ئەوان لەرووبار گوزەریان کرد و ڕووبەڕووی دەیلەمییەکان بوونەوە. دوو مانگیان بەشەڕ و کوشتار بەسەر برد و سەرئەنجام تورکەکان پاشەکشێیان کرد و عەلا شوێنپێی هەڵگرتن. بینی ئەوان بەرەو واسط دەڕۆن. عەلا دەستی لەشوێنکەوتنی ئەوان هەڵگرت و لەعەسکەر موکەرەم نیشتەجێ بوو.

## ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر لەئاندۆلۆس

لەم ساڵەدا مەنسور محەممەد کوڕی باوکی عامر، فەرمانڕەوای ئاندۆلۆس، بۆ هوشام مۆئەیید، سوپایەکی بۆ جەنگ لەسەرزەمینی ڕۆمییەکان ڕەوانە کرد تا بەهاوکاری ئەم سوپایە دژی فەرەنگییەکان بجەنگن. ئەوان بەهاوکاری ئەم سوپایە ڕووبەڕووی فەرەنگەکان بوونەوە و زەرەر و زیانی زۆریان لێدان و تاڵانی زۆریان دەستکەوت. ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی فەرەنگەکان و غەرسیەیان ئەسیر کرد. غەرسیە پاشای فەرەنگ و مناڵی پاشایەك لەپاشاکانی ئەو سەرزەمینە بوو کە بەشانجە ناویان دەبرد. ئەو بەگەورەترین پاشای ئەوان لەقەڵەم دەدرا. بەرێکەوت وتاردەری مەنسور بەناوی باوکی عەلا کوڕی ساعید کوڕی حەسەنی ڕەبعی،

لەسەرزەمینی موسڵەوە مەبەستی ئەوی کرد و لای نیشتەجێ بوو. پێش ئەم ڕۆژە وەسفی کرد و لەم ڕۆژەدا باوکی عەلا، ئاسکێکی پێشکەش بەمەنسور کرد و لەگەڵ ئاسکەکە ئەم هۆنراوەی بۆ نارد:

| | |
|---|---|
| یا حرز کل مخوف، و امان کل | مشرد و معز کل مذلل |
| جدواك ان تخصص به فلاهله | و تعم بالاحسان کل مؤمل |

واتاکەی: ئەی پاسەوانەی هەر ترساوێك و ئەمانەدەری هەر هەڵاتووێك و ڕێزبەخشی هەر ریسوایەك! بەخششەکانی خۆت ئەگەر تایبەت بکەیت، بەکەسانی شیاو دەگات و چاکەکاری خۆت بەهەر ئارەزوومەندێك دەگەیێنیت.

هەروەها لەم هۆنراوەدا هاتووە:

| | |
|---|---|
| مولای مؤنس غربتی، متخطفی | من ظفر ایمی، ممنع معقلی |
| عید رفعت بضبعه، و غرسته | فی نعمة اهدی الیك بایل |
| سمیته غرسیة، و بعثته | فی حبله لیتاخ فیه تفاولی |
| فلئن قبلت، فتلك اسنی نعمة | اسدی بها ذو نعمة و تطول |

واتاکەی: سەروەر و هاورێی من لەکاتی بێ کەسی و ئەو کەسەی منی لەچنگی ڕۆژگار پاراستووە و سەنگەری منی بەهێز کردووە. ئەم بەندەی کەتۆ دەستیت گرتووە (و بەرزت کردۆتەوە) و نیعمەتەکانی خۆت پێبەخشیوە، هەنووکە ئاسکێك بەدیاری بۆ تۆ دەنێرێت. من ئەم ئاسکەم ناوناوە غەرسیە و بەتەنافێك بۆ لای تۆی دەنێرم تا لێکدانەوەی باشی من ببێتە راستی، ئەگەر پێی رازی ببیت، گەورەترین نیعمەتە بۆ من کەکەسێکی ڕێزدار پێی بەخشیوم.

ئەم شاعیرە، ئەو ئاسکەی بەمەبەستی ئەسیر کرانی غەرسیە، بەغەرسیە ناو برد و غەرسیە ئەو ڕۆژەیە کەئەسیر کرا و ئەم ئاسکە پێشکەش بەمەنسور کرا. چەندە ڕووداوێکی سەیرە!!!!!

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەلی کوڕی ئەحمەدی ئەبەر قوهی وەزیر دوای گەڕانەوەی لەخوزستان بۆ بوتەیحە، ڕۆشتە لای بەها ئەلدەولە. ئەو پەنای بۆ

موهەزیب باللە بردبوو. بەها ئەلدەولە ئەوی وەك وەزیری خۆی هەڵبژارد. ئەو هاتە بارەگای بەها ئەلدەولە بەڵام ئەم کارە سەری نەگرت و بۆ بوتەیحە گەڕایەوە. فازڵ، وەزیری بەها ئەلدەولە، لەواست هاوڕێی ئەو بوو. کاتێك لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، داوای مۆڵەتی ڕۆشتن بۆ بەغدادی کرد و مۆڵەتی پێدرا. بەها ئەلدەولە، جارێکی دیکە داوای لەئەبەر قوهی کرد بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە بەڵام ئەبەر قوهی فریویدا و نەگەڕایەوە.

لەزیحەججە/ دێسامبەری ئەم ساڵە باوکی حەفس عومەر کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەییووب ناسراو بەکوڕی شاهین مرد. ئەو لەسەفەری ٢٩٧/ ئۆکتۆبەری ٩٠٩ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. حەدیسی زۆری دەزانی و بەکەسێکی بڕواپێکراو لەقەڵەم دەدرا.

لەزیقەعدە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە ئیمام باوکی حەسەن عەلی کوڕی عومەر کوڕی ئەحمەد کوڕی مەهدی ناسراو بەدارقەتنی، پێشەوای ناودار، کۆچی دوایی کرد.

لەرەبیع الاوەل/ ئاوریلی ئەم ساڵە، محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی سەکرەی هاشمی لەمناڵەکانی عەلی کوڕی مەهدی باللە کە لەشوێنکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب پەشیمان ببوویەوە، مرد. بەرادەیەك زمان پیس بوو کەخەڵکان خۆیان لەزمانی دوور دەخستەوە. یەکێك لەهۆنراوەکانی ئەمەیە:

| | |
|---|---|
| فی وجه انسانة کلفت بها | اربعة ما اجتمعن فی احد |
| الوجه بدر، و الصدغ غالیة | و الریق خمر، والثغر من برد |

واتاکەی: شەیدای روخساری دولبەرێك بووم کەچوار تایبەتمەندی بوو کەکەس نەیبوو: روخسارێکی وەك مانگی شەوی چواردە، زولفی بۆنخۆشی کەکەوتۆتە سەر ناوچاوی، شەرابی مەستکەری لێوەکانی و ددانەکانی کە لەبەفر سپیترن.

لەم ساڵەدا یوسف کوڕی عەمرۆ کوڕی مەسروق، باوکی فەتحی قەواسی خۆپارێز لەمانگی رەبیع الاوەل/ ئاوریل لەتەمەنی پەنجا و پێنج ساڵی کۆچی دوایی کرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و شەشی کۆچی ( ٩٦٦ زایینی )

## مەرگی عەزیز باللە و هاتنە سەرکاری حاکمی کوڕی و دەرئە نجامی جەنگەکان تا بەهێز بوون و سەقامگیر بوونی فەرمانڕەوایەتییەکەی

لەبیست و هەشتی ڕەمەزان/ پانزەی ئۆکتۆبەری ئەم ساڵە عەزیز باوکی مەنسور نێزار کوڕی موعێز باوکی تەمیمی مەعدی عەلەوی، فەرمانڕەوای میسر، لەتەمەنی چل و دوو ساڵ و هەشت مانگ و نیوی لەبەڵبیس مرد. ئەو بۆ جیهاد لەگەڵ ڕۆمییەکان ڕۆشتە بەڵبیس کەچەندین نەخۆشی وەك کەم ئاوی، بەردی میزەڵان، قوڵنج، بەرۆکیان گرت و سەرئەنجام گیانیان گرت.

ئەو بیست و یەك ساڵ و پێنج مانگ و نیو فەرمانڕەوایەتی کرد. عەزیز باللە لەئەفریقییە چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

ئەو پیاوێکی باڵابەرز، ئەسمەر، موو سوور و چوارشانە بوو، ئەسپ و گەوهەری بەباشی دەناسی. دەڵێن ئەو عیسا کوڕی نەستورسی مەسیحی وەك وەزیر هەڵبژارد و لەشاو پیاوێکی جوولەکەی وەك نوێنەری خۆی دانا بەناوی مونشا. مەسیحی و جوولەکەکان شانازیان بەخۆیانەوە دەکرد و ئازاری موسوڵمانانیان دەدا. خەڵکانی میسر چیرۆکێکیان نووسی و ئەو چیرۆکەیان دایە دەستی بووکەڵەیەکی سەر کاغەز کەتیایدا نووسرابوو: ئەی ئەو کەسەی بەمونشا ڕێز لەجوولەکەکەکان گرت و بەنەستورس ڕێزت لەمەسیحییەکان و موسوڵمانەکانت ریسوا کرد، ئایا فریای من ناکەویت و ئەم ستەمە لەسەر شانی من هەڵناگریت؟ ئەم بووکەڵە و نامەکەی دەستیان لەسەر ڕێگەی عەزیز باللە دانا. کاتێك عەزیز بینی، فەرمانیدا بۆی ببەن و کاتێك خوێندییەوە، هەستی بەمەبەستەکەی کرد. مەنشا و عیسای قۆڵبەست و لەعیسا سێسەد هەزار دینار و سامانێکی زۆری لەمونشا سەند.

عەزیز باللە، بەخششی خۆش دەویست و کاری پێدەکرد. یەکێك لەخۆڕاگرییەکانی سەبارەت بەیەکێك لەشاعیرەکانی میسر بەناوی حەسەن کوڕی بیشری دیمەشقی بوو کە لەهۆنراوەکانیدا بەردەوام سەرکۆنەی دەکرد. ئەو یەعقوب کوڕی کلس، وەزیری عەزیز باللە و دەبیری کلس، باوکی عەبدوللە حسەینی قیروانی بەم شێوەیە سەرکۆنە کردووە:

قل لابی نصر صاحب القصر و المتانی لنقض ذا الامر

انقض عری الملك للوزير تفز منه بحسن الثناء و الذكر

و اعط، وامنع و لا تخف احدا فصاحب القصر ليس فی القصر

و ليس يدری ماذا يراد به و هو اذا ما دری فما يدری

واتاکەی: بەباوکی نەسر، خاوەنی کۆشك و کەسێك کەبیر لەپچڕاندنی ئەم تەنافە دەکاتەوە، بڵێ: بیانوو و پاساوەکانی فەرمانڕەوایەتی لەوەزیر بستێنە تا بەم شێوەیە ناوێکی جوان بۆ خۆت بەجێبێڵیت، گەر دەخوازی ببەخشە، گەرناخوازی مەبەخشە، لەکەس مەترسە چوونکە خاوەنی کۆشك لەکۆشکدا نییە و ئەو نازانێت چی بەسەر دێت و ئەگەر بزانێت (لەراستیدا) نازانێت.

کوڕی کلّس سکالاّی بردە لای عەزیز باللە و هۆنراوەکەی بۆ خوێندەوە. عەزیز پێی وت: من و تۆم لەم هۆنراوەی سەرکۆنە کردنە شەریکین، کەواتە لەبەخشینی ئەویش شەریکی من بە. دواتر ئەم شاعیرە، فەزلی فەرماندەی بەم شێوەیە سەرکۆنە کرد:

تنصر، فالنتصر دين حق عليه زماننا هذا يدل

و قل بثلاثة عزوا و جلوا و عطل ما سواهم فهو عطل

فيعقوب الوزير اب و هذا العزيز ابن، و روح القدس فضل

واتاکەی: بڕۆ و باوەڕ بەئایینی مەسیحی بێنە چوونکە دینێکی بڕواپێکراوە و ڕۆژگاری ئێمە شایەتە و بەسێ پیرۆزەکە کەرێزدار و پیرۆزن، باوەڕ بێنە و جگە لەوان پشتگوێ بخە چوونکە فیڕۆن. یەعقوبی وەزیر، باوك و عەزیز کوڕ و فەزڵ ڕۆح ئەلقدوسە.

فەزڵ سکالاّی بردە لای عەزیز باللە. عەزیز باللە هەرچەند تووڕە بوو بەلاّم پێی وت: لێی خۆش ببە و فەزڵ بەخشی. دواتر وەزیر هاتە لای عەزیز باللە و پێی وت: چیتر بەخشین کەڵکی نییە چوونکە ئەم کارە گرنگی نەدان بەسیاسەت و کاروباری حکومەتە. ئەو بەتۆ و من و هاونشینی تۆ کوڕی زەبارج جوێن دەدات و دواتر ئەم هۆنراوەی هێنایە سەرزمان:

زبارجی و کلسی وزير نعم علی قدر الكلب يصلح الساجور

واتاکەی: زەبارجی هاونشینە و کلّسی وەزیر، بەڵێ، قەلادەی سەنگ شیاوە بۆی.

عەزیز باللە تووڕە و فەرمانیدا حەسەن کوڕی بیشر بگرن. حەسەن دەسبەجێ

قۆلبەست کرا. دواتر عەزیز لەمەبەستەکەی پەشیمان و ویستی ئازادی بکات. ئەوی بۆ بارەگاکەی بانگ کرد. وەزیر سیخوڕێکی لەناو کۆشك دانا بوو و ئەوی لەم هەواڵە ئاگادار کردەوە. وەزیر فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

کاتێك پەیکی عەزیز باڵلە گەیشتە لای حەسەن، ئەوی بەسەر بڕواوی بینی، گەڕایەوە و عەزیزی لەکوژرانی ئەو ئاگادار کردەوە. عەزیز باڵلە خەمبار بوو.

کاتێك عەزیز باڵلە مرد، کوڕەکەی باوکی عەلی مەنسور لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت و نازناوی حاکم بامرالله ی پێبڕا. ئەم نازناوە لەسەر داوای باوکی بوو. باوکی عەلی مەنسور تەمەنی یانزە ساڵ و شەش مانگ زیاتر نەبوو کەجێگەی باوکی گرتەوە. عەزیز باڵلە لەوەسیەت نامەکەی خۆی، ئەرجوانی خزمەتکاری کەکاروباری ماڵەکەی ئەوی ئەنجامدەدا، وەك هەڵسوڕێنەری کاروباری حکومەتی کوڕەکەی دیاریکردبوو. ئەرجوان بۆ ئەنجامدانی فەرمانی عەزیز، ئامادەیی نیشاندا و دەستی بەیعەتی بۆ درێژ کرد و بەیعەتی لەخەڵکان بۆ وەرگرت. حەسەن کوڕی عەمار، گەورە و سەروەری هۆزی کەتامە پێش کەوت و لەحکومەتەکەی حاکم فەرمانڕەوایەتی دەکرد و نازناوی ئەمین ئەلدەولەی پیبڕا. ئەو لەناو عەلەوییەکانی میسر یەکەم کەس بوو ئەم نازناوەی پێبڕا. کەسانی بڕواپێکراوی خۆی داوایان لێکرد حاکم بکوژێت. ئەوان وتیان: پێویستمان بەکەسێك نییە ئێمە بکاتە بەندەی خۆی، بەڵام ئەمین ئەلدەولە چوونکە ئەوی بەمناڵ دەزانی، لەکوشتنی ئەو چاوپۆشی کرد.

هۆزی کەتامە لەوڵات بڵاو ببوونەوە و فەرمانڕەوایەتییان دەکرد و دەستدرێژیان دەکردە سەر گیان و سامانی خەڵك. ئەرجوان لەکۆشکی حاکم دەژیا و پارێزگاری لێدەکرد. شوکری خزمەتکاری عێزەد ئەلدەولە، پەیمانی لەگەڵ ئەمین ئەلدەولە بەست. ئامارژەمان پێدا کەشەرەف ئەلدەولە ئەوی گرت و ڕەوانەی میسری کرد. کاتێك ئەم دووانە یەکیانگرت، ئەرجوان نامەیەکی بۆ مەنجوتەکین نووسی و سکاڵای لەکوڕی عەمار کرد. مەنجوتەکین سوپای ڕازاندەوە و لەدیمەشقەوە بەرەو میسر بەرێکەوت. کوڕی عەمار ئاگادار بوویەوە. وای بڵاو کردەوە کەمەنجوتەکین دژی حاکم ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە و سوپاییەکانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هاندا. سوپایەکی گەورەی بۆ جەنگی مەنجوتەکین ڕەوانە کرد و باوکی تەمیم سلێمان کوڕی جەعفەر کوڕی فەلاحی کەتامی وەك فەرمانـدەی سوپاکە هەڵبژارد.، ئەم سوپایە

لەعەسقەلان ڕووبەڕووی سوپای مەنجوتەکین بوویەوە. مەنجوتەکین و سوپاکەی شکستیان خوارد و دوو هەزار کەسیان لێ کوژرا. مەنجوتەکین ئەسیر کرا و بردیانە میسر. کوڕی عەمار نەیکوشت و بۆ دڵنەوایی کردنی ڕۆژهەڵاتییەکان (خەڵکانی بەرەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلام) ئازادی کرد.

کوڕی عەمار، باوکی تەمیمی کەتامی کەناوی سلێمان کوڕی جەعفەر بوو، وەك فەرمانڕەوای شام دیاریکرد. ئەو ڕێگەی تەبەرییەی گرتەبەر و عەلی برای کردە فەرمانڕەوای دیمەشق بەڵام خەڵکانی ئەو شارە پێی ڕازی نەبوون. باوکی تەمیم نامەیەکی بۆ نووسین و هەڕەشەی کرد. ئەوان ترسان و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی براکەی نیشاندا و لەکردەوەی نەزانانەی خۆیان داوای بەخشینیان کرد و بۆ پێشوازی کردنی عەلی ڕۆشتن. عەلی بێ ئەوەی گرنگی بەدانیشتووانی شارەکە بدات، سوار لەسەر ئەسپ، ڕۆشتە ناو شارەکە و سووتاندی و کوشتی و بۆ ئوردووگاکەی گەڕایەوە.

باوکی تەمیم خۆی ڕۆشتە دیمەشق و چاکەی لەگەڵ دانیشتووانی شارەکە کرد و زیندانییەکانی هێنایەدەر و جڵەوی کاروباری گرتەدەست و عەلی برای بۆ تەرابلوس نارد و جەیش کوڕی سەمسامەی کەتامی لەوێ لابرد و دواتر ڕێگەی میسری گرتەبەر و چاوی بەئەرجوان کەوت بۆ ئەوەی حەسەن کوڕی عەمار لەناو ببەن. ئەرجوان دووری کەتامە لەگەڵ باوکی تەمیمی لەمیسر بەدەرفەت زانی تا ڕۆژهەڵاتییەکان بۆ لەناو بردنی پاشماوەی ئەوان بۆ میسر ڕەوانە بکات و کوڕی عەماریش لەگەڵ ئەوان لەناو ببات.

کوڕی عەمار ئاگادار بوویەوە وبیری لەهێرش کردنە سەر ئەرجوان و شوکری عێزەدی کردەوە. سیخوڕەکان ئەم دووانەیان لەمەبەستی کوڕی عەمار ئاگادار کردەوە. ئەرجوان و شوکر وشیار بوونەوە و بەگریان و پاڕانەوە ڕوویان لەکۆشکی حاکم کرد. ئاگری شۆڕش بڵێسەی سەند و ڕۆژهەڵاتییەکان کۆبوونەوە. ئەرجوان سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا بەخشییەوە و ئەوان ڕووبەڕووی کوڕی عەمار و هاوەڵانی بوونەوە. کوڕی عەمار هەڵات و خۆی شاردەوە.

کاتێك ئەرجوان سەرکەوتنی بەدەست هێنا، حاکمی هێنایەدەر و لەسەر تەخت داینیشاند و دووبارە بەیعەتی بۆ وەرگرتەوە و نامەی بۆ سوپاسالارەکان و خەڵکانی

دیمەشق نووسی تا باوکی تەمیم لەناو ببەن. کاتێک باوکی تەمیم هاتەخۆی کەدانیشتووانی دیمەشق هێرشیان کردەسەر و گەنجینەکانیان تالآن کرد و ئەو هەلآت و دیمەشقی بەجێهێشت. خەڵکان کەتامییەکانیانی هاورێی ئەویان کوشت و دووبارە شۆڕش و ئاژاوە لەدیمەشق سەری هەڵدا و تازە پێگەیشتووەکان جڵەوی کاروبارەکانیان گرتەدەست.

ئەرجوان دواتر مۆڵەتی بەحەسەن کوڕی عەماردا لەشوێنەکەی خۆی بێتەدەر و زەوییەکانی بۆ گەڕاندەوە و فەرمانی پێدا دەرگای ماڵەکەی ببەستێت.

لەم کاتەدا خەڵکانی سور ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و خزمەتکارێک بەناوی عەلاقەیان کردە فەرمانڕەوای خۆیان. مەفرەج کوڕی دەغفەل کوڕی جەڕاحیش ناسازگاری دەستپێکرد و ڕۆشتە ڕەملە و خراپەکاری کردە پیشە.

بەرێکەوت دوقس، پاشای ڕۆم، لەقەلآی ئەفامییە دابەزی بوو. ئەرجوان سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی جەیش کوڕی سەمسامە ڕەوانە کرد. ئەم سوپایە گەیشتە ڕەملە و کارگوزارەکەی ملکەچی خۆی نیشاندا. بەهەمان شێوە سەرکەوتنی بەسەر باوکی تەمیم بەدەست هێنا و ئەوی گرت و سوپایەکی بەفەرماندەیی باوکی عەبدوللە حسەین کوڕی ناسر ئەلدەولە کوڕی حەمدان بۆ سور نارد. ئەم سوپایە لەدەریا و وشکانییەوە هێرشی کردە سەر ئەو شارە. عەلاقە پەیکی بۆ لای پاشای ڕۆم نارد و داوای هاوکاری کرد. پاشای ڕۆم چەند کەشتییەکی لێوانلێو لەجەنگاوەری بۆ نارد. کەشتییەکان ڕووبەڕووی کەشتی موسوڵمانەکان بوونەوە و جەنگ ڕوویدا و موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و ڕۆمییەکان شکستیان خوارد و دەستەیەکیان لێ کوژرا. کاتێک ڕۆمییەکان کوژران، دانیشتووانی سور پشتیوانیان نەما و وەری خۆیان دۆڕاند. باوکی عەبدوللە کوڕی حەمدان دەستی بەسەر سوردا گرت و سامانەکانی تالآن و ژمارەیەکی زۆر لەجەنگاوەرانی ئەو شارەی کوشت. ئەمە یەکەم سەرکەوتنی ئەرجوان بوو. عەلاقە ئەسیر و ڕەوانەی میسر کرا. لەوێ پێستیان داماڵی و لەداریاندا. باوکی عەبدوللە لەسور مایەوە. جەیش کوڕی سەمسامە مەبەستی هێرش کردنە سەر مەفرەج کوڕی دەغفەلی کرد. مەفرەج هەلآت و دواتر پەیکی نارد و خوازیاری وەرگرتنی ئەمان بوو. جەیش ئەمانی پێبەخشی.

جەیش هێرشی کردە سەر سوپای ڕۆم و کاتێک گەیشتە دیمەشق، خەڵکانی ئەو

شـاره ملکەچـی خۆیـان بـۆ فەرمانـەکان نیـشاندا. ئـەو ڕێـزی لەسـەرکردە تازەپێگەیـشتووەکان گـرت و مانگانـەی بـۆ دیـاریکردن. هـەروەها خـوێنی مەغربییـە سەرکێشەکانی بەڕەوا لەقەڵەمدا و خەڵکانی دیمەشق بەبوونی ئەو ئاسوودە بوون.

جـەیش لەدیمەشـقەوە بـەرەو ئەفامییـە بەرێکـەوەت. ڕۆمییـەکان لـەوێ سـوپایان ڕازاندەوە. جەیش و سوپاکەی شکستیان خوارد و هەڵاتن. تەنیا بەشارەی ئەخشیدی لەگەڵ پێنسەد سوار خۆراگری کرد و جنگی دژی ڕۆمییەکان درێژە پێدا. ڕۆمییەکان گەیـشتنە ئوردووگـای موسـوڵمانان و تاڵانیـان کـرد. دوقـس لای ئاڵاکـەی خـۆی وەستابوو و کوڕەکەی و چەند گەنجێکی دیکە لەبەردەمیدا بوون. جەنگاوەرێکی کورد بەناوی ئەحمەد کوڕی زوحاك لەهاوەڵانی بەشارە مەبەستی کوشتنی پاشای کرد. دوقس گومانی کرد داوای ئەمان دەکات. کاتێك زوحاك لێی نزیك بوویەوە، هێرشی بردەسەر و بەکەرپووچەکەی[١٠] دەستی کوشتی. موسوڵمانان دەنگیان بەرز کردەوە: دوژمـنی خـوا کـوژرا، هـەڵاتووان بـۆ گۆڕەپـانی جـەنگ گەڕانـەوە و موسـوڵمانان سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـا و ڕۆمییـەکان شکـستیان خـوارد و ژمارەیـەکی زۆر لەسەربازەکانیان کوژران.

جـەیش تـا پـشت دەروازەی ئەنتاکییـە لـەتاڵانی بـەردەوام بـوو، ئەسـیری دەکـرد و دەیسووتاند. دواتر بۆ دیمەشق گەڕایەوە و لەدەرەوەی شارەکە ئوردووی لێدا. زستان بوو. خەڵکانی دیمەشق داوایان لێکرد بڕواتە ناو شارەکە بەڵام ئەو کارەی نەکرد و ڕۆشـتە مـاڵی لـەهیا. چـاکەی لەگـەڵ دانیـشتووانی ئـەو شـارە کـرد و سـەرکردە تازەپێگەشتووەکانی لەخۆی نزیك کردەوە و ژمارەیەك لەوانی وەك پەردەداری خۆی دەستنیشان کرد. ڕۆژانە بۆ ئەوان و هاوڕێکانیـان خوانی رادەخست. هـەرکام لەوان لەگـەڵ دەسـتەیەك لـەهاوڕێکانیان لەسـەر خوانەکـەی جـەیش دادەنیـشتن و کاتێـك لەخواردن تەواو دەبوون، جەیش داوای لێدەکردن بڕۆنە ژوورێکـی دیکە و دەستیان بشۆن. ڕۆژگار بەم شێوەیە بەسەر چوو تا ئەوەی ڕۆژێك فەرمانی بەهاوەڵانیـدا کاتێك سەرکردە تازەپێگەیـشتووەکان بەمەبەسـتی دەسـت شـۆرین دەڕۆنـە ژوورێکـی دیکـە، درەگاکانیان لەسەر ببەستن و دەستبەجێ بیانکوژن. بۆ بەیانی کاتێك خواردن خورا و ڕۆشـتنە ژوورەکـەی دیکـەی بەمەبەسـتی دەسـت شـۆڕین، دەرگاکانیـان لـێ داخـرا و

---

[١٠]- کەرپووچ: خشت

نزیکەی سێ هەزارکەسیان لێ کوژرا. سەرە براوەکانیان بەناو شارەکەدا گەڕاند. خەڵکان خوازیاری دادپەروەری و بەخششی ئەو بوون. ئەو لێیان خۆش بوو و گەورەکانی لەبارەگاکەی کۆکردەوە و سەرکردە تازپێگەشتووەکانی لەبەرچاوی ئەواندا کوشت. گەورەکانی دیمەشقی بۆ میسر نارد و سامانی ئەوانی تالآن کرد. لەم کاتەدا جەیش گرفتاری نەخۆشی لێدانی دڵ بوویەوە و بەهۆیەوە مرد.

دوای جەیش محەممەدی کوڕی هاتەسەر کرا. فەرمانڕەوایی جەیش لەدیمەشق نۆ مانگ درێژەی کێشا. دواتر ئەرجوان نامەی بۆ بەسیلی پاشای ڕۆم نووسی و بۆ دە ساڵ پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و کاروبارەکان لەسەر دەستی ئەرجوان سامان درا. ئەو سوپایەکی بۆ بەرەقە و تەرابلوسی ڕۆژئاوا (لیبیای ئەمرۆ) ڕەوانە و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینانەدا گرت و ئەنسی سەقلەبی وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچانە دەستنیشان کرد. بەردەوام مۆجیاری حاکمی دەکرد و بەردەوام لای ئەو بوو تا ئەوەی حاکم هەستی بەقورسایی ئەو کرد و لەساڵی ٣٨٩/٩٩٨ زایینی، حاکم، فەرمانی کوشتنی ئەرجوانیدا.

ئەرجوان خواجەیەکی سپیپێست بوو، وەزیرێکی مەسیحی بوو بەناوی فەهد کوڕی ئیبراهیم. حاکم ئەوی وەك وەزری خۆی هەڵبژارد و دواتر بەحسەین کوڕی جەوهەر، جێگەی ئەرجوانی پڕ کردەوە و نازناوی سەرکردەی سەرکردەکانی پێبەخشی و حەسەن کوڕی عەماری کوشت و دوای ئەو حسەین کوڕی جەوهەری کوشت و بەردەوام وەزیری دەگۆڕی و وەزیری پێشووتری دەکوشت. حاکم، یارخەتکینی ئامادە و ڕەوانەی حەلەبی کرد. یارخەتکین گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە. سوپایەکی گەورەی لەگەڵدا بوو. یارخەتکین دەستی لەگەمارۆی سەر حەلەب هەڵگرت. لەم کاتەدا حەسان کوڕی مەفرەجی تائی لێی ترسا و کاتێك یارخەتکین لەغەزەوە رووی کردە عەسقەلان، حەسان و باوکی بۆسەیان نایەوە و هێرشیان کردە سەر خۆی و سوپاکەی و سەرئەنجام یارخەتکینیان ئەسیر کرد و کوشتیان. حەسان و باوکی گەمارۆیان خستەسەر ڕەملە و ئەو سنوورەیان تالآن کرد. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان پەیوەستی ئەم دوانە بوون و ڕەملە و بەشەکانی سەرەوەی ئەو شارەیان داگیر کرد. ئەم هەواڵە بۆ حاکم دژوار و نەشیاو بۆ رازی بوون بوو. ئەو دوانەی سەرکۆنە کرد بەلآم نۆشداروو بوو دوای مەرگی سۆهراب. حەسان و باوکی پەیکیان بۆ لای شەریف

باوکی فتوح حەسەن کوڕی جەعفەری عەلەوی حەسەنی، ئەمیری مەککە نارد و بەسەروەری باوەڕداران ناویان برد و داوایان لێکرد بڕواتە لایان بۆ ئەوەی بەیعەتی لەگەڵ ببەستن. ئەو ڕۆشتە لایان و نوێنەرێکی لەمەککە بەجێهێشت و بەناوی ئەو وتاریان خوێندەوە.

حاکم نامەی بۆ حەسان و باوکی نووسی و بەڵێنی پێدانی زەوی و دیاری گرانبایی پێدان. دڵنەوایی ئەوانی کرد و ئەوان پشتیان کردە باوکی فتوح و ئەویان بۆ مەککە گەڕاندەوە و دووبارە ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی حاکم نیشاندا.

لەم کاتەدا حاکەم سوپایەکی بەرەو شام نارد و فەرمانـدەیی سوپاکەی بەعەلی کوڕی جەعفەر کوڕی فەلاح سپارد. ئەم سوپایە کاتێك گەیشتە ڕەملە، حەسان کوڕی مەفرەج و کەسەکانی ئەو ناوچەیان بەجێهێشت و سامانەکەیان لەقەڵای شەرات دەستی بەسەردا گیرا. عەلی کوڕی جەعفەر سامان و پاشەکەوتەکانی ئەوی تاڵان کرد و هاوشێوەی فەرمانڕەوای دیمەشق ڕێگەی ئەوشارەی گرتەبەر و لەشەواڵی ٣٩٠/ سێپتامبەری ١٠٠٠ زایینی گەیشتە ئەو شارە.

حەسان دوو ساڵ ئاوارە بوو. دواتر باوکی بۆ لای حاکم نارد. حاکم ئەمانی بەباوکی حەسان بەخشی و زەوی زۆری خستە بەردەست. دواتر حەسانیش ڕێگەی میسری گرتەبەر. حاکم ڕێزی لەویش گرت. مەفرەج باوکی حەسانیان ژەهرخوارد کرد. بکوژەکەی فەرمانی حاکمی جێبەجێ کرد. بەمەرگی باوکی، حەسانیش لاواز بوو.

## زاڵبوونی سوپای سەمسام ئەلدەولە لەبەسرە

لەم ساڵەدا یەکێك لەسەرکردەکانی سوپای سەمسام ئەلدەولە بەرەو بەسرە بەرێکەوت. کارگوزارەکانی بەها ئەلدەولە شارەکەیان بەجێهێشت. ئەم سەرکردەیە بەلەشکرستان ناوی دەبرا.

چۆنیەتییەکی بەم شێوە بوو: کاتێك – وەك ئامارژەی پێدرا– تورکەکان لەعەلا شکستیان خوارد، لەشکرستان لای عەلا مایەوە. لەدەیلەمییەکانی سوپاکەی بەها ئەلدەولە چوارسەد کەس هاتنە لایان و داوای ئەمانیان کرد. لەشکرستان ئەوانی

گرت و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر. ژمارەیان زیادی کرد و لەنزیك بەسرە، ڕۆشتنە ناو باخەکان و ڕووبەڕووی سوپاکەی بەها ئەلدەولە دەبوونەوە. ژمارەیەك لەخەڵکانی بەسرە پەیوەستیان بوون. یەکێك لەوان سەرکردەکەیان، باوکی حەسەن کوڕی باوکی جەعفەری عەلەوی بوو. ئەم دەستەیە خواردەمەنییان بۆ بەسرە دەبرد.

بەها ئەلدەولە لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە و کەسانێکی بۆ گرتنی ئەوان نارد. ژمارەیەکی زۆر لەوان بۆ پەیوەست بوون بەلەشکرستان هەڵاتن. لەشکرستان بەهێز بوو. ئەوان کەشتییەکانیان هێنا و لەشکرستان و سوپاکەی سوار کەشتییەکان بوون و لەبەسرە دابەزین و ڕووبەڕووی سوپاکەی بەها ئەلدەولە بوونەوە و ئەوانیان لەبەسرە دەرپەڕاند. لەشکرستان فەرمانڕەوایەتی بەسرەی گرتەدەست. ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکەکەی کوشت و ژمارەیەکی دیکە ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. لەشکرستان بەشی زۆری سامانی ئەوانی تاڵان کرد.

بەها ئەلدەولە ئەم هەواڵەی بۆ موهەزیب ئەلدەولە نووسی وپێی وت: تۆ بۆ فەرمانڕەوایەتی بەسرە شیاوتریت. موهەزیب ئەلدەولە سوپایەکی بەفەرماندەیی عەبدوڵلە کوڕی مەرزوق بۆ بەسرە نارد. لەشکرستان هەڵات و شارەکەی بەجێهێشت. دەڵێن ئەو بێ ئەوەی دەست بۆ شمشێر ببات، بەسرەی بەجێهێشت و کوڕی مەرزوق ڕۆشتە ناو شارەکە. دەستەیەکیش دەڵێن لەشکرستان دوای جەنگێکی خوێناوی شارەکەی بەدوژمنەکەی سپارد چوونکە نەیتوانی لەبەرابەر سوپاکەی کوڕی مەرزوق خۆڕاگری بکات. بەم شێوەیە فەرمانڕەوایەتی بەسرە کەوتە دەستی موهەزیب ئەلدەولە.

لەشکرستان هەوڵیدا بۆ بەسرە بگەڕێتەوە و بەکەشتی هێرش بکاتە سەر شارەکە. سوپاکەی ڕۆشتنە بازاری خواردەمەنییەکان و جەنگیان هەڵگیرساند. لەشکرستان نامەی بۆ بەها ئەلدەولە نووسی و خوازیاری ئاشتی بوو و ملکەچ بوونی بۆ فەرمانەکان نیشاندا و ڕازی بوو بەوەی لەبەسرە بەناوی بەها ئەلدەولە وتار بخوێنێتەوە. موهەزیب ئەلدەولە بەم پێشنیارە ڕازی و کوڕەکەی لەشکرستانی وەك بارمتە لای خۆی گرت.

لەشکرستان وای نیشان دەدا هەم لەسەمسام ئەلدەولە، هەم لەبەها ئەلدەولە و هەم موهەزیب ئەلدەولە فەرمان دەبات و بەم شێوەیە بۆ ماوەیەك ستەمی لەخەڵکی بەسرە کرد و خەڵکی ئەوشارە بڵاو بوونەوە. دواتر دادپەروەری لەناو ئەواندا بڵاو کردەوە و بەم شێوەیە خەڵکان بۆ شارەکەیان گەڕانەوە.

## فەرمانڕەوایی مەقلەد لەموسڵ

لەم ساڵەدا مەقلەد کوڕی موسەییب دەستی بەسەر موسڵدا گرت.

چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: براکەی یانی باوکی زەواد لەم ساڵەدا مرد و مەقلەد چاوی تەماحی بڕییە موسڵ بەڵام منداڵەکانی عوقەیل هاوکارییان نەکرد و برا گەورەکەی یانی عەلییان هێنایە سەرکار. مەقلەد خێرایی لەخۆی نیشاندا و دەیلەمییەکانی هاوڕێی باوکی جەعفەری حەجاجی لەموسڵ هاندا و ژمارەیەکیان پەیوەستی بوون. مەقلەد نامەیەکی بۆ بەها ئەلدەولە نووسی و بەڵێنی پێدا ساڵانە دوو هەزار درهەمی لەموسڵەوە بۆ بنێرێت. دواتر ڕۆشتە لای عەلی برای و وای نیشاندا بەها ئەلدەولە موسڵی خستۆتە ژێر فەرمانی ئەو و داوای لێکرد دژی باوکی جەعفەر هاوکاری بکات چوونکە ئەوی بەچەقڵی سەر ڕێگەی خۆی دەبینی. مەقلەد و هاوەڵانی ڕێگەی موسڵیان گرتەبەر و هەموو ئەو دەیلەمییانەی مەقلەد ڕێزی گرتبوون، پەیوەستی ئوردووگاکەی بوون و حەجاج لاواز و داوای ئەمانی کرد و پێی بەخشرا. حەجاج بەڵێنی پێدان ڕۆژێك پەیوەستیان دەبێت.

حەجاج پێش گەیشتنی ئەو ڕۆژە سوار کەشتی بوو و موسڵی بەجێهێشت و کاتێك ئاگادار بوونەوە کەئەو شارەکەی بەجێهێشتبوو. دەستەیەك شوێنی کەوتن بەڵام نەیانگرت. حەجاج سامانەکەی خۆی بەجێهێشت و ڕۆشتە لای بەها ئەلدەولە. مەقلەد ڕۆشتە موسڵ و لەگەڵ براکەی ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی وتار بەناوی هەردووکیان بخوێننەوە و لەبەر تەمەن، سەرەتا ناوی عەلی بێتە سەرزمان و عەلی لەکۆکردنەوەی باج نوێنەرێکی لای مەقلەد ببێت و بەم شێوەیە پێکەوە کاروباری شارەکە بەڕێوە ببەن. عەلی ڕووی کردە دەشت و مەقلەد لەشارەکە

مایەوە. بارودۆخ بەم شێوە بەردەوام بوو تا ئەوەی دوژمنایەتی دەرکەوت و بەخواستی خوا ئاماژە بەچەند و چۆنییەکەی دەدەین.

مەقلەد، سەرپەرەستی رۆژئاوای عێراقی لەسەرزەمینەکانی فورات لەدەستا بوو. ئەو لەبەغداد نوێنەرێکی بوێر و چاونەترسی بوو. لەنێوان ئەم نوێنەرە و هاوەڵانی بەها ئەلدەولە ناسازگاری روویدا. ئەو نامەی بۆ مەقلەد نووسی و لەم بارودۆخە سکاڵای کرد. مەقلەد و سوپاکەی لەموسڵەوە هێرشیان برد و لەنێوان ئەوان و سوپاکەی بەها ئەلدەولە جەنگ روویدا و شکستی خوارد. دواتر نامەیەکی بۆ بەها ئەلدەولە نووسی و لەکردەوەکەی پەشیمان بوویەوە و داوای لێکرد کەسێك بنێرێت تا بۆ فەرمانبەری خۆی و شتەکانی دیکە پەیمانی پێ بدات.

لەم کاتەدا کەبەها ئەلدەولە سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ براکەی بوو، بەئاشتی و رازی بوون بەخواستەکانی مەقلەد ناچار بوو. مەقلەد بۆ بەدەست هێنانی سامانەکان دەستی درێژ کرد. نوێنەرەکەی بەها ئەلدەولە لەبەغداد، باوکی عەلی کوڕی ئیسماعیل، دەرکەوت و بۆ جەنگی مەقلەد بەرێکەوت. مەقلەد ئاگادار بوویەوە و سوپاکەی بۆ هێرشی لەناکاو ڕەوانە کرد. هاوەڵانی هێرشێکی لەناکاویان ئەنجامدا و گەڕانەوە. کاتێك بەها ئەلدەولە ئاگادار بوویەوە سوپاکەی مەقلەد هێرشی کردۆتە سەر بەغداد، باوکی جەعفەری حەجاجی بۆ بەغداد نارد و فەرمانی پێدا رێگەی ئاشتی لەگەڵ مەقلەد بگرێتەبەر و باوکی عەلی کوڕی ئیسماعیل بگرێت. حەجاج لەکۆتایی زیحەججە/ پانزەی ژانویە بەرەو بەغداد بەرێکەوت و کاتێك گەیشت، مەقلەد نامەیەکی بۆ نووسی و خوازیاری ئاشتی بوو. هەردووك بەو مەرجە پەیمانی ئاشتییان واژۆ کرد کەمەقلەد ساڵانە دە هەزار دینار بۆ بەها ئەلدەولە بنێرێت و لەشارەکان جگە بۆ پشتیوانی کردن لەفەرمانڕەوایەتی بەغداد هیچ وەرنەگرێت و لەکاتی وتارخوێندنەوە لەمزگەوتەکان دوای بەها ئەلدەولە ناوی باوکی جەعفەر بێت و لەبەرابەر، بەها ئەلدەولە خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی و نازناوی حسام ئەلدەولەی پێببەخشێت و زەوی موسڵ، کوفە، قەسر و جامعەین بەو بسپێرێت. بەم شێوەیە پەیمانەکە نووسرا و خەلیفە قادر پشت راستی کردەوە.

مەقلەد لەهەموو خاڵەکان تەنیا بۆ ڕەوانە کردنی سامان، ڕێزی لەپەیمانەکە کرد و دەستی بەسەر شارەکاندا گرت و دەستدرێژی کردە سەر سامانی خەڵکان و ئاژاوەگێر و شەڕئەنگێزەکان لەدەوری کۆبوونەوە و پێگەی بەرز و سەرئەنجام، باوکی جەعفەر، باوکی عەلی گرت و دواتر باوکی عەلی، نوێنەری بەها ئەلدەولە هەلآت و بەشێوەیەکی نهێنی ڕێگەی بوتەیحەی گرتەبەر و پەنای بۆ موهەزیب ئەلدەولە برد.

## مەرگی مەنسور کوڕی یوسف و فەرمانڕەوایی بادیسی کوڕی

لەسەرەتاکانی ڕەبیع الاوەل/ مارسی ئەم ساڵە مەنسور کوڕی یوسفی بولکین، فەرمانڕەوای ئەفریقییە، لەدەرەوەی سەبرە مرد و لەکۆشکەکەی بەخاك سپێردرا.

ئەو پاشایەکی بەخشندە، بوێر، دورئەندیش و بەراستی مەنسور (سەرکەوتوو) بوو. کردەوەکانی چاکەکارانە و دادپەروەری و خەڵکانی خۆش دەویست و دادی بڵاو دەکردەوە. پاشماوەی قەرزی خەڵکانی ئەفریقییەی بەخشی کەبڕەکەی زۆر بوو.

کاتێك مەنسور مرد، بادیس بەنازناوی باوکی مەناد جێگەی باوکی گرتەوە و کاتێك بارودۆخی سەقامگیر کرد، ڕێگەی سەردانیەی گرتەبەر. خەڵکان لەهەموو ناوچەکانەوە بۆ سەرەخۆشی و پیرۆزبایی کردن دەڕۆشتتننە لای. مناڵەکانی زیری، مامەکانی باوکی، مەبەستی ناسازگارییان کرد بەڵام سوپاکەی بادیس و باوکی ڕێگەی ئەو کارەیان پێنەدان.

ساڵی لەدایك بوونی بادیس ٩٨٤/٣٧٤ زایینیە و دوای مەرگی مەنسور، لەلایەن حاکم بامرالله، لەمیسرەوە خەلآتی فەرمانڕەوایەتی بۆ نێردرا و فەرمانەکەیان بۆ خوێندەوە. ئەو لەگەڵ دەستەیەك لەمام و ئامۆزەکانی بەیعەتیان لەگەڵ حاکم بەست.

لەم ساڵەدا پیاوێك لەسەنهاج بەناوی خەلیفە کوڕی موبارەك، دژی بادیس ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. ئەویان بردە لای بادیس. سوار کەریان کرد و لەبەر ریسوایی و کەم بەهایی، زیندانییان کرد.

لەم ساڵەدا بادیس، حیماد کوڕی یوسفی بولکینی مامی وەك فەرمانڕەوای ئەشیر دەستنیشان کرد. چوارپێ وکەرەستەی جەنگی زۆری خستە بەردەست. حیماد بەرەو ئەو سەرزەمینە بەرێکەوت. ئەم حیمادە باوەگەورێی منداڵەکانی حیمادە کەدواتر پاشایەتی ئەفریقییەیان گرتەدەست. قەڵای تایبەت بەناوی ئەوان لەئەفریقییە بەناوبانگە. عەبد مۆئمین کوڕی عەلی دەستی بەسەر ئەم قەڵایەدا گرت.

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا بەها ئەلدەولە، وەزیرەکەی، فازڵی گرت و سامانەکەی زەوت کرد و دووبارە شاپور کوڕی ئەردەشێری وەك وەزیری خۆی هەڵبژارد. ئەو نزیکەی دوو مانگ لەو پێگەدا مایەوە. ئەو سامانێکی زۆری بڵاو کردەوە و لەبەر کەمتەرخەمی بەها ئەلدەولە، بۆ دروست کردنی چەند بەرەکی پارەی لەناو سەرکردەکان دابەش کرد. دواتر بۆ بوتەیحە هەڵات و پێگەی وەزارەت چۆڵ کرا. بەها ئەلدەولە، باوکی عەباس کوڕی سەرجسی وەك وەزیری تازە هەڵبژارد.

لەم ساڵەدا خەلیفە قادر، باوکی حەسەن عەلی کوڕی عەبدعەزیز کوڕی نەعمانی پەردەداری وەك دەبیری خۆی دەستنیشان کرد.

لەشەعبان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی ئیسحاق باوکی حامید کوڕی باوکی ئیسحاق موزەکی نەیشابوری مرد. ئەو بەپێشەوا دادەنرا. لەساڵی ٩٣٤/٣٢٣ زاییني چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا عەلی کوڕی عومەر کوڕی محەممەد کوڕی حەسەن باوکی ئیسحاقی حومەیری، ناسراو بەسوکری، و حەربی و کیال، کۆچی دوایی کرد. ئەو لەساڵی٩٠٨/٢٦٩ زاییني چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەم ساڵەدا باوکی ئەغور دەبیس کوڕی عەفیفی ئەسەدی لەخوزستان و باوکی تالیب محەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەتییەی مەککی، نوسەری قوت القلوب، هەردووك مردن.

دەڵێن ئەو لەکاتی نووسینی قوت القلوب، لەقووتی عروقی بەردی[11] توێشووی خۆی دابین دەکرد.

[11]– بەردی: جۆرە ڕوەکێکە هاوشێوەی قامیشی شەکر. میسرییە کۆنەکان لەم ڕووەکە و لیفەکانی، کاغەزیان دروست دەکرد. وەرگێر.

## ڕووداوەكانی ساڵی سێسەد و هەشتا و حەوتی كۆچی( ٩٩٧ زایینی )

## چۆنیەتی مەرگی ئەمیر نوح كوڕی مەنسور و فەرمانڕەوای مەنسوری كوڕی

لەرەجەب/ جولای ئەم ساڵە ئەمیر ڕەزی نوح كوڕی سامانی مرد. بەمردنی ئەو سیلسیلەی فەرمانڕەوایەتی سامانییەكان لەرووخان نزیك بوویەوە و هێز و پێگەی خۆیان لەدەستدا و فەرمانڕەوای ناوچەكان چاوی تەماحیان تێبڕین و دوای ماوەیەكی كەم فەرمانڕەوایەتی ئەوان بۆ هەمیشە كۆتایی پێهات.

كاتێك ئەمیر نوح مرد، كوڕەكەی باوكی حەرس مەنسور كوڕی نوح جێگەی باوكی گرتەوە و فەرمانڕەوا و سەركردەكان دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ كرد. ئەو پاشماوەی سامانەكەی لەناو ئەواندا بەخشییەوە وهەموان بۆ فەرمانبەری كردنی ئەو هاودەنگ و هاوهەڵوێست بوون. بەكتوزون كاروباری فەرمانڕەوایەتی ئەوی بەڕێوە دەبرد. كاتێك ئیلەك خان لەمەرگی ئەمیر نوح ئاگادار بوویەوە، ڕووی كردە سەمەرقەند و فائیق پەیوەستی بوو. ئیلەك خان بەخێرایی ئەوی بۆ بوخارا ڕەوانە كرد. كاتێك ئەمیر مەنسور لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، سەرگەردان و لەكۆكردنەوەی هێز ناتەوان بوو. لەبەر ئەمە بوخارای بەجێهێشت و فائیق ڕۆشتە ناو بوخارا و وای نیشاندا دەخوازێت بۆ پارێزگاری كردن لەمافی خۆی و باوكانی لەخزمەتی ئەمیر مەنسوردا بێت چوونكە ئەمیر مەنسور بەگەورە و سەروەری ئەوان لەقەڵەم دەدرا. بۆ ئەم مەبەستە پیر و گەورەكانی بوخارای بۆ لای ئەمیر مەنسور نارد تا بۆ شار و سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی بگەڕێتەوە و پێشتر خۆی چەندین بەڵێن و پەیمانی پێدان. ئەمیر مەنسور بۆ بوخارا گەڕایەوە و ڕۆشتە ناو شارەكە و فائیق جڵەوی كاروبارەكانی گرتەدەست و لەفەرمانڕەوایەتی ئەودا، فەرمانڕەوایەتی دەكرد و بەكتوزونی كردە فەرماندەی سوپاكەی.

لەو كاتەدا مەحمود كوڕی سەبوكتەكین سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ ئیسماعیلی برای بوو. بەخواستی خواوەند ئاماژە بەچەند و چۆنی ئەو ڕووداوە دەدەین. بەكتوزون ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر و فەرمانڕەوایەتی شارەكەی گرتەدەست و كاروبارەكان لەو ناوچەیە ئارام بوو.

## مەرگی سەبوکتەکین و فەرمانڕەوایەتی ئیسماعیلی کوڕی

لەشەعبان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە ناسر ئەلدەولە سەبوکتەکین کۆچی دوایی کرد. ئەو لەبەڵخ مابوویەوە و چەندین ماڵی لەوێ دروست کردبوو. نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا و بۆ کەڵك وەرگرتن لەئاو و هەوای غەزنە، لەبەڵخەوە بەرەو ئەو دیارە بەڕێکەوت و لەرێگە دووایین هەناسەکانی هەڵکێشا. جەنازەی ئەویان بردە غەزنە و لەوێ بەخاکیان سپارد. ئەو نزیکەی بیست ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد.

سەبوکتەکین پیاوێکی دادپەروەر، چاکەخواز و جەنگاوەر لەرێگەی خوا و جوامێر و ئەمانەتدار بوو. بەم شێوە خواوەند لەنیعمەتەکانی خۆی پێبەخشی و فەرمانڕەوایی بنەماڵەکەی بۆ چەندین ساڵی درێژ بەردەوام بوو تەنانەت زیاتر لەسەلجوقییەکان و سامانییەکان.

مەحمودی کوڕی یەکەم کەس بوو نازناوی سوڵتانی پێبرا. پێشتر کەسیان بەم ناوە بانگ نەدەکرد.

کاتێك سەبوکتەکین لەمەرگی خۆی دڵنیا بوو، ئیسماعیلی کوڕی وەك جێگری خۆی هەڵبژارد و کاتێك مرد، سوپا دەستی بەیعەتی بۆ ئیسماعیل درێژ کرد و سوێندی بۆ خوارد. ئیسماعیل سامانێکی زۆری لەناو ئەواندا بلاّو کردەوە. ئەو لەمەحمودی برای گەنجتر بوو. سوپاییەکان ئەویان بەبچوك زانی و بەرادەیەك لەوەرگرتنی رۆژانەی خۆیان زێدەڕۆییان کرد کەگەنجینەکانی باوکی خاڵی بوویەوە.

## زاڵبوونی مەحمود کوڕی سەبوکتەکین بەسەر ئیسماعیلی برای

کاتێك سەبوکتەکین مرد و هەواڵی مەرگی ئەو لەنەیشابور بەکوڕەکەی یەمین ئەلدەولە مەحمود گەیشت، پرسەی بۆ گێڕا و پەیکی بۆ لای ئیسماعیلی برای نارد و بۆ مەرگی باوك، دڵنەوایی کرد و پێی وت ئەگەر باوکی ئەوی وەك جێگری خۆی هەڵبژاردووە لەبەر دووری ئەو (مەحمود) بووە و چەندین مەرجی بیرهێنایەوە کە بەهۆیانەوە دەبوا برا گەورە پێش کەوێت و داوای لێکرد رێگەی سازگاری و هاوکاری بگرێتەبەر و ئەوەی لەسامانی باوکی ماوەتەوە، بۆی بنێرێت. نێردراوەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان کرد بەلاّم رێکنەکەوتن. مەحمود لەنەیشابورەوە رێگەی هەراتی

گرتەبەر و ویستی لەغەزنە براکەی ببینێت. لەھەرات مامەکەی، بوغراجیق، پشتی گرتێ و بۆ زاڵبوون بەسەر ئیسماعیلی برای ھاوکاری کرد. ئەو بەرەو بۆست بەرێکەوت کە لەژێر فەرمانی نەسری برایدا بوو. نەسریش بەدوای ئەو رێگەی غەزنەی گرتەبەر.

ئیسماعیل لەھاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە. ئەو لەبەلخ بوو. بۆ ئەم مەبەستە بەخێرایی رێگەی غەزنەی گرتەبەر و پێش ئەوان گەیشتە شارەکە. فەرماندەکانی ھاورێی ئیسماعیل نامەیان بۆ مەحمود نووسیبوو و داوایان لێکرد بڕواتە لایان و بەڵێنی ھاوکارییان پێدابوو. مەحمود بەخێرایی رێگەی غەزنەی گرتەبەر و لەدەرەوەی شارەکە رووبەرووی ئیسماعیل بوویەوە و شەڕێکی قورس دەستی پێکرد و دەرئەنجام ئیسماعیل شکستی خوارد و لەقەڵای غەزنە پەنای گرت. مەحمود گەمارۆی خستەسەر و بەڵێنی پێدا ئەمانی پێدەبەخشێت بەو مەرجەی لەقەڵاکە بێتەخوار. کاتێك ئیسماعیل لەقەڵاکە ھاتەدەر، مەحمود رێزی گرت و چاکەی لەگەڵ کرد. پێگەی بەرز کردەوە و ئەوی لەفەرمانڕەوایەتییەکەی خۆی کردە شەریك و بۆ بەڵخ گەڕایەوە.

ئیسماعیل حەوت مانگ فەرمانڕەوایەتی کرد. ئەو پیاوێکی فرەزان و بیرمەند بوو، ھەم ھۆنراوەی باشی دەھۆنییەوە و ھەم پەخشانی جوانی دەنووسی. لەھەندێك لەنوێژەکانی ھەینی لای خەڵکان ئامادە دەبوو. لەکاتی وتار خوێندنەوە بەناوی خەلیفە ئەم ئایەی خوێندەوە: پەروەدگارا! تۆ فەرمانڕەواییت بەمن بەخشی و توانای لێکدانەوەی خەوت پێدام، ئەی ئافرێنەری ئاسمان و زەوی، تەنیا تۆ لەم دنیا و ئەو دنیا سەروەری منیت، وەك موسوڵمانێك بممرێنە و پەیوەستی کەسە شیاوەکانم بکە.[١٢]

## مەرگی فەخر ئەلدەولە کوڕی بویە و فەرمانڕەوای مەجد ئەلدەولەی کوڕی

لەشەعبان/ ئۆگۆستی ئەم ساڵە، فەخر ئەلدەولە باوکی حەسەن عەلی کوڕی رۆکن ئەلدەولە باوکی عەلی حەسەن کوڕی بویە لەقەڵای تەبەرق کۆچی دوایی کرد.

---

[١٢] یوسف/ ١٠١، رب قد اتیتنی من الملك و علمتنی من تاویل الاحادیث، فاطر السموات و الارض انت ولیی فی الدنیا و الاخرة، توفنی مسلما و الحقنی بالصالحین

چۆنیەتی مردنی ئەو بەم شێوە بوو: دوای خواردنی گۆشتی برژاو، ترێی خوارد و دڵ ئێشە بەرۆکی گرت. ئەم دەردە ئازاری دەدا و سەرئەنجام گیانی گرت. لەکاتی مەرگی ئەو، کلیلی گەنجینەکانی لای دایکی کوڕەکەی، مەجد ئەلدەولە بوو. بەدوای کفندا گەران بەلام دەستیان نەکەوت. ڕۆشتنە ناو شاریش لەترسی شۆڕشی دەیلەمییەکان دژوار بوو. لەمجێوری مزگەوتەکە کفنیان کڕی و کفنیان کرد و چوونکە شۆڕش و ئاژاوە تەشەنەی کرد، نەیانتوانی بەخاکی بسپێرن تا ئەو کاتەی بۆگەنی کرد و دواتر بەخاکیان سپارد.

دوای مەرگی ئەو، کوڕەکەی، مەجد باوکی تالیب رۆستەم، کەچوار ساڵ زیاتر نەبوو، جێگەی باوکی گرتەوە. فەرماندەکان ئەویان وەك فەرمانڕەوا دیاری کرد و فەرمانڕەوایەتی هەمەدان و قەرمیسی تا سنوورەکانی عێراقیان بەشەمس ئەلدەولەی برای بەخشی. بەڕێوەبردنی ولات لەئەستۆی دایکی مەجد ئەلدەولەدا بوو. فەرمانەکان بەراوێژ کردن بەو ئەنجام دەدران. باوکی تاهیر، هاوڕێی فەخر ئەلدەولە و باوکی عەباسی زەببی کاف، جێبەجێ کەری فەرمان و کاروبارەکان بوون.

## مەرگی مەئمون کوڕی محەممەد و فەرمانڕەوایەتی عەلی کوڕی

لەم ساڵەدا مەئمون کوڕی محەممەد، فەرمانڕەوای خوارەزم و جەرجانییە، مرد و دوای مەرگی، لەسەر فەرمانڕەوایەتی عەلی کوڕی ڕێککەوتن و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. ئەو نامەی بۆ یەمین ئەلدەولە مەحمود کوڕی سەبوکتەکین نووسی و خوازبێنی خوشکەکەی لێکرد. مەحمود خوشکەکەی کردە هاوسەری ئەو. هەردووك یەك هەڵوێست و یەك هێز بوون تا ئەو کاتەی عەلی مرد و دوای ئەو، براکەی باوکی عەباس مەئمون کوڕی مەئمون هاتە سەرکار و جێگەی براکەی گرتەوە. ئەویش نامەی بۆ یەمین ئەلدەولە مەحمود کوڕی سەبوکتەکین نووسی و خوازبێنی خوشکەکەی کرد. مەحمود خوشکەکەی کردە هاوسەری ئەو. ئەم دوانەیش بۆ ماوەیەك هاو هەڵوێست و هاودەنگ بوون.

بەخواستی خوا، گێڕانەوەکانی تایبەت بەم دوانە لەساڵی ٤٠٧/١٠١٦ زایینی باس دەکەین تا بەتەواوی لەبارودخۆی ئەوان ئاگادار ببنەوە.

## مەرگی عەلا کوڕی حەسەن و ڕووداوەکان دوای ئەو

لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەلا کوڕی حەسەن، نوێنەری سەمسام ئەلدەولە لەخوزستان مرد. ئەو لەعەسکەر موکەڕەم مرد. ئەو پیاوێکی بوێر، چاونەترس و دوورئەندێش بوو. سەمسام ئەلدەولە، باوکی عەلی کوڕی ئوستاد هورموزی لەگەڵ پارە بۆ ئەو دیارە نارد وئەو پارەی لەناو دەیلەمییەکان بڵاو کردەوە و ڕێگەی جوندیشاپوری گرتەبەر و سوپاکەی بەها ئەلدەولەی لەوێ دوور کردەوە. لەنێوان ئەم دوو سوپایە چەندین جەنگ ڕوویدا و سەرئەنجام ئەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا و تورکەکانی لەخوزستان دوور کردەوە. تورکەکان بۆ واست گەڕانەوە و وڵات بەتەواوی کەوتە ژێر فەرمانی عەلی. ئەو کارگوزارەکانی هەڵبژارد و باجی کۆکردەوە و نامەی بۆ تورکەکان نووسی و دڵنەوایی کردن. بەشێك لەتورکەکان پەیوەستی بوون. ئەو چاکەی لەگەڵ کردن. باوکی عەلی فەرمانڕەوایەتی هەموو ناوچەکانی خوزستانی گرتەدەست.

دواتر باوکی محەممەد کوڕی موکەڕەم و تورکەکان لەواست گەڕانەوە و باوکی عەلی خۆی بۆ جەنگ ئامادە کرد. جەنگ لەنێوان ئەوان هەڵگیرسا و تورکەکان نەیانتوانی بەسەر دەیلەمییەکان سەرکەوتن بەدەست بێنن و دوبارە بۆ واست گەڕانەوە. بەرێکەوت، ڕێگەی بەها ئەلدەولە لەبەسرە بۆ قەنتەرەی بەیزا بوو. بەخواستی خواوەند دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

## قۆڵبەست کرانی عەلی کوڕی موسەییب و ڕووداوەکانی دوای ئەوە

لەم ساڵەدا مەقلەد، عەلی برای قۆڵبەست کرد.

چۆنیەتییەکەی وەك ئاماژەمان پێدا، ناسازگاری هاوەڵانی ئەم دووانە لەموسڵ بوو. وەك باسمان کرد مەقلەد لەعێراق سەرقاڵ بوو. کاتێك لەکێشەکانی ئەم سەرزەمینە ڕزگاری بوو، بۆ موسڵ گەڕایەوە و بڕیاریدا تۆڵە لەهاوەڵانی براکەی بستێنێت بەڵام ترسا و بۆ گرتنی ئەو ڕێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر. بۆ ئەم مەبەستە سەربازە دەیلەم و کوردەکانی خۆی کۆکردەوە و ئاگاداری کردنەوە کەمەبەستی هێرش کردنە سەر دەقوقای هەیە و بۆ فەرمانبەری کردنی خۆی سوێندیدان. ماڵی ئەو لەتەنیشت ماڵی

براکەی بوو. کونێکی لەدیوارەکەدا دروست کرد و ڕۆشتە سەر سەری براکەی کەسەرخۆش بوو. ئەوی گرت و بردیی بۆ گەنجینە و دەستی بەسەر هەموو سامانەکەیدا گرت. دواتر ئەوی قۆلبەست کرد و پەیامی بۆ هاوسەرەکەی نارد کەپێش ئاگادار بوونی براکەی، حەسەن، لەم هەواڵە دوو منالەکەی، قەرواش و بەدران هەڵبگرێت و ڕێگەی تکریت بگرێتەبەر. هاوسەرەکەی ئەو کارەی کرد و رزگاری بوو. ئەو لەحیللە، کە لەچوار فەرسەنگی تکریت بوو، مایەوە.

حەسەن ئەم هەواڵەی بیست و ڕێگەی حیللەی گرتەبەر تا منالەکانی براکەی بگرێت بەلاّم ئەوانی نەدۆزییەوە. مەقلەد لەموسلْ مایەوە و گەورەکانی عەرەبی بانگ کرد و خەلاّتی پێبەخشین. نزیکەی دوو هەزار سوار لەدەوری کۆبوونەوە. حەسەن جل و بەرگی براکەی لەبەر کرد و لەگەلْ کوڕەکان و ئەندامانی خێزانەکەی بەرێکەوت و هێزەکانی دژی مەقلەد ئامادە کرد. نزیکەی دە هەزار کەس پەیوەستی بوون. ئەو نامەی بۆ مەقلەد نووسی و پێشنیاری جەنگی پێکرد.

مەقلەد لەموسڵەوە بەرێکەوت. دووری نێوان دوو سوپا بوو بەیەك مەنزلْ. مەقلەد لەبەرابەر عەلەس دابەزی. سەرکردە عەرەبەکان ڕۆشتنە لای و هاتوچۆیان کرد. دەستەیەك لەوان پێشنیاری جەنگیان پێکرد کەرافیع کوڕی محەممەد مەقن لەناویاندا دەبینرا و دەستەیەکیش وەك غەریب کوڕی محەممەد کوڕی مەقن خوازیاری دەست کێشانەوە لەجەنگ بوون. بەمشێوەیە رافیع کوڕی محەممەد ڕووبەڕووی غەریب کوڕی محەممەدی برای بوویەوە.

لەم بگرە وبێنەدا بەمەقلەد وترا: خوشکەکەت روهەیلە، کچی موسەییب ئامادەیە سەردانی تۆ بکات. مەقلەد سوار ئەسپەکەی بوو و ڕۆشتە لای. خوشکەکەی لەگەڵی مایەوە تا ئەوەی مەقلەد براکەی، عەلی ئازاد کرد و سامانەکانی بۆ گەڕاندەوە و ئەوی لەخێوەتێکدا نیشتەجێ کرد. خەڵکان بەم کارە شادمان و هەموان پەیمانیان بەست. عەلی بۆ سنوری دەسەلاّتی خۆی لەحیللە گەڕایەوە. مەقلەد بۆ موسلْ گەڕایەوە و سوپای ئامادە کرد تاهێرش بکاتە سەر باوکی حەسەن عەلی مەزیدی ئەسەدی. باوکی حەسەن لەبراکەی مەقلەد، عەلی، لایەنگیری دەکرد و دەیویست زیان لەسنووری دەسەلاّتی مەقلەد بدات. مەقلەد بۆ جەنگی ئەو بەرێکەوت.

کاتێك عەلی لەزیندان هاتەدەر، عەرەبەکان لەدەوری کۆبوونەوە و داوایان لێکرد

دژی مەقلەدی برای شۆڕش بکات. عەلی ڕێگەی موسڵی گرتەبەر کەهاوەڵانی مەقلەد لەوێ کۆببوونەوە. ئەوان ڕێگەیان لەعەلی گرت بەڵام عەلی بەسەر موسڵدا زاڵ بوو. مەقلەد ئەم هەواڵەی بیست و بۆ موسڵ گەڕایەوە و لەڕێگە لەسنووری دەسەڵاتی حەسەنی برای، لەحیللە گوزەری کرد. حەسەن پێشوازی لێکرد و کاتێك ژمارەی زۆری سوپاکەی ئەوی بینی، لەگیانی عەلی برای ترسا و داوای لەمەقلەد کرد ڕێگەی بدات ئەم بارودۆخە چاکبکاتەوە. حەسەن ڕۆشتە لای عەلی برای و پێی وت: ئەو یەك چاوە (مەقلەد) لەگەڵ سوپایەکی بێ ژمار بەرەو ئێرە دێت و تۆ بێ ئاگا دانیشتوویت. داوای لەعەلی کرد چەند بەرەکی لەناو سوپاکەی مەقلەد دروست بکات. عەلی نامەی بۆ سوپاکەی مەقلەد نووسی بەڵام مەقلەد نامەکانی گرت و بەخێرایی بەرەو موسڵ بەڕێکەوت. عەلی و حەسەن ڕۆشتنە لای و ڕێگەی سازگارییان گرتەبەر و هەموان ڕۆشتنە ناو موسڵ.

لەم کاتەدا عەلی ترسا و شەوانە لەموسڵ هەڵات. حەسەنیش بەدوای ئەو ڕێگەی هەڵاتنی گرتەبەر. پەیکەکان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد و سەرئەنجام لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەهەرکام لەم دوو برایە (عەلی و حەسەن) بەئامادە نەبوونی ئەوەی دیکە بڕواتە ناو شارەکە. ئەم بارودۆخە تا ساڵی ٩٨٨/٣٨٩ زایینی درێژەی کێشا.

عەلی لەساڵی ٩٩٠/٣٩٠ زایینی مرد و حەسەن جێگەی ئەوی گرتەوە. مەقلەد لەگەڵ منداڵەکانی خەفاجە هێرشی کردەسەر و ئەو بۆ عێراق هەڵات. مەقلەد شوێنی کەوت بەڵام چوونکە نەیتوانی بیگرێت، گەڕایەوە.

کاتێك مەقلەد لەدەست عەلی برای ئاسوودە بوو، هێرشی کردە سەر سنوری عەلی کوڕی مەزیدی ئەسەدی و دووبارە ڕێگەی ئەو سەرزەمینەی گرتەبەر. کوڕی مەزید پەنای بۆ موهەزیب ئەلدەولە برد. موهەزیب ئەلدەولە نێوەنجیگەری کرد و ئاشتی لەنێوان ئەواندا سەقامگیر کرا. دواتر مەقلەد هێرشی کردە سەر دەقوقا و ملکەچی کرد.

## زاڵبوونی جبرەئیل لەدەقوقا

لەم ساڵەدا جبرەئیل کوڕی محەممەد دەستی بەسەر دەقوقا[١٢]دا گرت. جبرەئیل یەکێك لەسەربازە پیادە ئێرانییەکان لەناو سوپای بەغداد و لەبوتەیحە خزمەتی موهەزیب ئەلدەولەی دەکرد. ئەو مەبەستی جەنگی کرد و دەستەیەکی فراوانی کۆکردەوە، کەڕەستەی جەنگی کڕی و بەرێکەوت و لەرێگە لەدەقوقا گوزەری کرد. بینی مەقلەد کوڕی موسەییب گەمارۆی خستۆتەسەر. دانیشتووانی ئەم شارە داوای هاوکارییان لەجبرەئیل کرد. ئەو پشتیوانی کرد و بەلای مەقلەدی لەوان دوورخستەوە.

دوو پیاوی نەسرانی لەدەقوقا شارەکەیان لەژێر فەرماندا بوو. ئەم دوو کەسە چییان بویستایە ئەنجامایان دەدا و خەڵکیان دەکردە کۆیلە. دەستەیەك لەموسوڵمانان بەجبرەئیلیان وت: تۆ دەخوازیت بجەنگیت و نازانیت ئەنجامێکی دەبێت یا نە. ئەم دوو پیاوە مەسیحییە لەناو ئێمەدا دەژین و ملکەچی فەرمانی ئەوانین. ئەگەر لەناو ئێمەدا بمێنیتەوە و لەدەست ئەو دوو پیاوە رزگارمان بکەیت، بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانت هاوکاریت دەکەین. جبرەئیل مایەوە و ئەو دوو پیاوە مەسیحییەی قۆڵبەست کرد. پێگەی بەرز بوویەوە و لەرەبیع الاوەل/ مارس دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. رێگەی چاکەکاری لەگەڵ خەڵکی شارەکە گرتەبەر و لەگەڵ هەموو ناسازگارییەکان بۆ ماوەیەك لەشارەکە مایەوە.

دواتر مەقلەد دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و بەدوای ئەو محەممەد کوڕی عەناز و دواتر قەرواش فەرمانڕەوایەتی شارەکەیان دەکرد و سەرئەنجام کەوتە دەستی فەخر ئەلدەولە باوکی غالیب. لەم کاتەدا جبرەئیل بۆ دەقوقا گەڕایەوە و پەیمانی لەگەڵ سەرکردەیەکی کورد بەست بەناوی موسەك کوڕی جەکویە. ئەم دووانە کارگوزارەکەی فەخر ئەلدەولەیان لەشارەکە دەرپەڕاند و دەستیان بەسەردا گرت. دواتر مەقلەد مەبەستی هێرش کردنە سەر شارەکەی کرد و ئەو دووانەی (جبرەئیل و جەکویە) دەرپەڕاند.

---

[١٢]- شارێکە لەنێوان ئەربیل و بەغداد (داقوق)

**بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك**

لەم ساڵەدا باوکی حەسەن عەلی کوڕی مەزید سەرپێچی فەرمانەکانی بەها ئەلدەولەی کرد. بەها ئەلدەولە سوپایەکی بۆ جەنگی ئەو نارد و باوکی حەسەن بۆ شوێنێك هەڵات کەکەس نەیدەتوانی بیگرێت. دواتر بەها ئەلدەولە پەیکی نارد و ئاشتی لەنێوان خۆیان سەقامگیر کردەوە و باوکی حەسەن دووبارە ملکەچی خۆی بۆ فەرمانەکان نیشاندا.

لەم ساڵەدا باوکی وەفا محەممەد کوڕی موهەندسی ژمێریار مرد.

لەموحەرەم/ ژانویەی ئەم ساڵە عوبەیداللە کوڕی محەممەد کوڕی حیمران باوکی عەبدوڵلەی عوکبەری ناسراو بەکوڕی بەتتەی حەنبەلی، مرد. ئەو لەشەوالی ٣٠٤/ مارسی ٩١٧ لەدایك بوو. پیاوێکی خۆپارێز و زانا بوو بەڵام حەدیسەکانی لاوازە.

لەزیقەعدە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە باوکی حسەین محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل ناسراو بە کوڕی سەمعونی واعیز، مرد. ئامۆژگارێکی لەخواترس بوو. لەساڵی ٣٠٠/٩١٢ زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

لەنۆی زیحەججە/ چواردەی سێپتامبەری ئەم ساڵە حەسەن کوڕی عەبدوڵلە کوڕی سەعید باوکی ئەحمەدی عەسکەری مرد. ئەو حەدیس بێژ، شارەزای دین، نووسەری چەندین کتێب لەبواری ئەدەب و لۆغەت .... بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێسەد و هەشتا و هەشتی کۆچی ( ٩٨٨ زایینی )

### گەڕانەوەی باوکی قاسمی سیمجوری بۆ بەغداد

پێشتر وتمان باوکی عەلی کوڕی سیمجور برای باوکی عەلی ڕۆشتە جورجان و لەوێ مایەوە و کاتێك فەخر ئەلدەولە مرد، لای مەجد ئەلدەولەی کوڕی مایەوە. ئەو نامەیەکی بۆ شەمس ئەلمەعالی نوسیبوو و ئەوی لەنەیشابورەوە بۆ لای خۆی بانگ کرد تا کاروبارەکانی پێ بسپێرێت. شەمس ئەلمەعالی بەرێکەوت تا گەیشتە جورجان، بەڵام کاتێك گەیشت، بینی باوکی قاسم لەوێ ڕۆشتووە. شەمس ئەلمەعالی بۆ نەیشابور گەڕایەوە.

فائیق لەبوخارا نامەیەکی بۆ باوکی عەلی نووسی و دژی بەکتوزون هانیدا و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر خوراسان و بەکتوزون لەو دیارە دەربەڕێنێت. ئەم هاندانە لەبەر دوژمنایەتی نێوان بەکتوزون و فائیق بوو. باوکی قاسم لەجورجانەوە هێرشی کردەسەر نەیشابور و دەستەیەکی بۆ ئەسفەراین ڕەوانە کرد. سوپایەکی بەکتوزون لەوێ نیشتەجێ کرابوون. ئەوان سوپاکەی بەکتوزونیان لەوشارە دەرپەڕاند و سوپاکەی باوکی قاسم جڵەوی کاروبارەکانیان گرتەدەست. باوکی قاسم هێرشی کردەسەر نەیشابور و لەرەبیع الاوەل/ مارس لەدەرەوەی شارەکە ڕووبەڕووی بەکتوزون بوویەوە و شەڕێکی خوێناوی و قورسیان دەست پێکرد. باوکی قاسم شکستی خوارد و هەڵات و ژمارەیەك لەسوپاکەی کوژران و ژمارەیەکی دیکەیان ئەسیر کران.

باوکی قاسم بەرەو قوهستان هەڵات و لەوێ مایەوە. سوپاکەی پەیوەستی بوون. لەوێوە ڕێگەی بوشەنجی گرتەبەر و دەستی بەسەردا گرت. بەکتوزون بەرەو ئەو دیارە ئەسپی غاردا. نێردراوان لەنێوان ئەوان هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی ئاشتی سەقامگیر کرا و بەکتوزون بۆ نەیشابور گەڕایەوە.

## زاڵبوونی مەحمود کوڕی سەبوکتەکین لەنەیشابور و گەڕانەوەی لەو شارە

کاتێك مەحمود لەدەست براکەی رزگاری بوو و دەستی بەسەر غەزنەدا گرت و بۆ بەلخ گەڕایەوە، بینی بەکتوزون فەرمانڕەوایەتی خوراسان دەکات. بۆ ئەم مەبەستە پەیکی بۆ لای ئەمیر مەنسور کوڕی نوح نارد و فەرمانبەری و پشتیوانی خۆی لەفەرمانڕەوایەتی ئەو، نیشاندا و داوای خوراسانی کرد. ئەمیر بۆ پێدانی خوراسان داوای لێبوردنی لێکرد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر تێرمێز، بەلخ و ئەو لای شارەکە لەکەنارەکانی بۆست و هەرات. مەحمود رازی نەبوو و دووبارە داوای خوراسانی کرد بەڵام ئەمیر رازی نەبوو. کاتێك مەحمود دڵنیابوو لەوەی ئەمیر فەرمانڕەوایەتی خوراسانی پێنادات، هێرشی کردە سەر نەیشابور کە لەژێر فەرمانی بەکتوزوندا بوو. کاتێك بەکتوزون ئاگادار بوویەوە، نەیشابوری بەجێهێشت. مەحمود ڕۆشتە ناو شارەکە و جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست. کاتێك ئەمیر مەنسور کوڕی نوح ئاگادار بوویەوە، لەبوخاراوە هێرشی کردە سەر نەیشابور. کاتێك مەحمود لەهێرشەکەی ئەمیر مەنسور ئاگادار بوویەوە، بەرەو مەرورود هەڵات و لای پردی راعول دابەزی و چاوەڕوانی پێشهاتەکانی دەکرد.

## گەڕانەوەی قابوس بۆ جورجان

لەم ساڵەدا شەمس ئەلمەعالی قابوس کوڕی وەشمگیر بۆ جورجان گەڕایەوە و دەستی بەسەردا گرت. کاتێك فەخر ئەلدەولە کوڕی بویە، فەرمانڕەوایەتی جورجان و ڕەی گرتەدەست، بڕیاریدا جورجان بەقابوس بسپێرێت. ساحەب کوڕی عیباد رێگەی ئەم کارەی لێگرت و جورجانی لەبەرچاوی فەخر ئەلدەولە بەشارێکی گەورە و گرنگ ناساند و فەخر ئەلدەولە لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە. فەخر ئەلدەولە هاورێیەتی خۆی و قابوسی لەخوراسان لەبیرکرد و گرنگی نەدا بەوەی جورجان لەبەر ئەم هۆکارە لەدەستی قابوسدا نەما. بەراستی فەرمانڕەوایەتی، برایەتی ناناسێت.

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەچۆن -ئەو کاتەی قابوس لەخوراسان مابوویەوە- جورجانی لەدەستدا هەرچەند فەرمانڕەوای سامانییەکان بەردەوام هێزی پشتیوانی و

هاوکارییان بۆ دەنارد بەڵام خواوەند نەیدەویست دەسەڵاتی ئەو دیارە بگرێتەدەست.

کاتێك سەبوکتەکین لەخوراسان فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، قابوس سەردانی کرد و بەڵێنی پێدا سوپایەکی لەگەڵدا بنێرێت و ئەو بۆ سنووری دەسەڵاتەکەی بگەڕێنێتەوە. سەبوکتەکین بەرەو بەڵخ دەڕۆشت کە لەرێگەدا مرد.

لەم ساڵەدا، دوای مەرگی فەخر ئەلدەولە، شەمس ئەلمەعالی قابوس، سوپاسالار شەهریار کوڕی شەروینی بۆ چیاکانی شەهریار نارد کە لەژێر فەرمانی رۆستەم کوڕی مەرزوبان، خاڵی مەجد ئەلدەولە کوڕی فەخر ئەلدەولەدا بوو. سوپاسالاری شەهریار رووبەرووی رۆستەم بوویەوە. رۆستەم شکستی خوارد و سوپاسالار دەستی بەسەر چیاکاندا گرت و بەناوی شەمس ئەلمەعالی وتاری خوێندەوە. باتی کوڕی سەعید کە لەکەنارەکانی ئێستنداریبە خوازیاری پەیوەست بوون بەشەمس ئەلمەعالی بوو، هێرشی کردە سەر ئامول کەسوپایەکی مەجد ئەلدەولەی لێ بوو. ئەو دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و بەناوی شەمس ئەلمەعالی وتاری خوێندەوە و ئەم هەواڵی بۆ نووسی.

دواتر خەڵکانی جورجان نامەیان بۆ قابوس نووسی و ئەویان بۆ لای خۆیان بانگ کرد. قابوس لەنەیشابورەوە بەرەو ئەو دیارە بەرێکەوت. سوپاسالار و باتی کوڕی سەعید هێرشیان کردە سەر جورجان چوونکەی سوپایەکی مەجد ئەلدەولە لەوێ دەبینرا. دوو سوپا رووبەرووی یەکبوونەوە و سوپاکەی مەجد ئەلدەولە شکستی خوارد و هەڵاتن و رێگەی جورجانیان گرتەبەر. کاتێك گەیشتنە جورجان، رووبەرووی پێشەنگەکانی سوپای قابوس بوونەوە و لەلەناوچوونی خۆیان دڵنیا بوون و دووبارە لەبەرابەر سوپاکەی قابوس هەڵاتن. شەمس ئەلمەعالی لەشەعبان/ جولای ئەم ساڵە ڕۆشتە ناو جورجان.

هەڵاتووان کاتێك گەیشتنە ڕەی، دووبارە سوپایان کۆکردەوە و لەڕەی، بەرەو جورجان بەرێکەوتن و گەمارۆیان خستەسەر. نرخی کەل و پەلەکان لەشارەکان زیادی کرد و بارودۆخێکی دژوار بەرۆکی سوپای گرت بەڵام بارینی باران و هەڵکردنی بای سارد، بارودۆخی لەو سوپایەی گەمارۆی خستبووە سەرجورجان، دژوارتر کرد و ئەوان بەناچاری کەنارەکانی جورجانیان بەجێهێشت. شەمس ئەلمەغالی شوێنیان کەوت و خۆی بەوان گەیاند و ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند. سوپای ڕەی شکستی

خـوارد و ژمارەیـەك لەگـەورەكانیان ئەسـیر و ژمارەیـەكی زیاتریـان كـوژران. شـەمس ئەلمـەعالی ئەسـیرەكانی ئـازاد كـرد و دەسـتی بەسـەر كـەنارەكانی نێـوان جورجـان و ئێستر ئابادداگرت.

دواتــر سوپاســالار بــیری لــەوە كــردەوە نافــەرمانی قــابوس بكــات و بناغــەی فەرمانڕەوایەتییەكەی تازە دابڕێژێت و لـەقابوس خۆی بەدوور بگرێت. سامانەكانی ئەو فریویدا. سوپاكەی ڕەی بەفەرماندەیی مـەرزوبان، خاڵی مەجد ئەلدەولە هێرشـی كردەسەر و سوپاسالار و سوپاكەی شكستیان خوارد. سوپاسالار ئەسیر كرا و لەبەر لێڵ بوونی پەیوەندی مـەرزوبان و مەجد ئەلدەولـە ، نـاوی شـەمس ئەلمـەعالیان بـەرز كردەوە. مەرزوبان لەمبارەوە نامەی بۆ شەمس ئەلمـەعالی نووسی و هـەموو سنووری چیاكان پەیوەستی جورجان و تەبەرستان بوو. شەمس ئەلمەعالی، مەنوچێهری كوڕی وەك فـەرمانڕەوای ئـەم سـەرزەمینانە دیـاریكرد. مەنوچـێهر دەسـتی بەسـەر رویـان و سالوسـدا گـرت (ئەگـەری هەیـە چالوسـی ئـەمڕۆیی بێـت). قـابوس نامـەی بـۆ یـەمین ئەلدەولــە مــەحمود نووســی و هــەردووك ڕێگــەی ئاشـتی و سـازگارییان گرتەبـەر و هاوهەڵوێست بوون.

## ڕۆشتنی بەها ئەلدەولە بۆ واست و دەرئە نجامەكەی

لـەم ساڵەدا باوكی عـەلی كوڕی ئیسماعیل كە لەواست بوو، دووبارە ملكەچـی خـۆی بـۆ فەرمانـەكانی بـەها ئەلدەولـە نیـشاندا و پێگـەی وەزارەتـی ئـەوی بەدەست هێنا و كاروبارەكانی بەڕێوە دەبرد. ئەو پێشنیاری بەبەها ئەلدەولە كرد بڕواتـە لای باوكی محەممـەد كوڕی موكـەرەم و سوپاكەی و هاوكارییـان بكـات. بـەها ئەلدەولـە ئـەو كـارەی كـرد و بەناڕەزامەندییـەوە ملـی ڕێگـەی گرتەبـەر و لەقەنتـەرەی بـەیزا دابەزی. لەوێ باوكی عـەلی كـوڕی ئوسـتاد هورمـوز و سـوپاكەی خۆڕاگرییـان كـرد. لەنێوان باوكی عەلی و بەها ئەلدەولە چەندین پێشهات روویاندا.

بارودۆخ بۆ بەها ئەلدەولـە دژوار و توێشوو بەزەحمـەت بەدەسـت دەهـات. داوای هاوكاری لەبەدر كوڕی حەسنەوییە كرد و ئەو بەشێك لەنیازەكانی بـەها ئەلدەولـەی دابین كرد. بەها ئەلدەولە رووبەرووی مەترسی ببوویـەوە و دوژمنـانی بـاوكی عـەلی

کوڕی ئیسماعیل، بەرادەیەك قسەیان بۆ هەڵبەست کەئەوەندەی نەمابوو، بەها ئەلدەولە، باوکی عەلی بکوژێت. لەم کاتەدا بەسەرهاتی دوو کوڕەکەی بەختیار و کوژرانی سەمسام ئەلدەولە- چەند وچۆنییەکەی ئاماژەی پێدەدرێت- بوو بەرێگە چارەیەك و باوکی عەلی پێگەی جارانی لای بەها ئەلدەولە بەدەست هێنایەوە و هەردووك هاوهەڵوێست بوون. بەخواستی خوا دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

## کوژرانی سەمسام ئەلدەولە

لەزیحەجە/ نۆڤەمبەری ئەم ساڵە، سەمسام ئەلدەولە کوڕی عێزەد ئەلدەولە کوژرا چۆنیەتییەکەی بەم شێوە بوو: ژمارەیەکی زۆر لەدەیلەمییەکان لەسەمسام ئەلدەولە دەترسان چوونکە سەمسام ئەلدەولە فەرمانیدا بوو ریز ببەستن بۆ ئەوەی بەناویاندا بگەڕێت و هەرکەسێك نەشیاو بێت، لەسوپاکەی دووری بخەنەوە. بەم شێوەیە هەزارکەس لەسوپاکە دوورخرانەوە و نەیاندەزانی چی بکەن.

بەرێکەوت، باوکی قاسم و باوکی نەسر، دوو کوڕەکەی عێزەد ئەلدین بەختیار، کەئەسیر بوون، پاسەوانی زیندانەکەیان فریودا و لەزیندان هەڵاتن و دەستەیەك لەکوردەکانیان لەدەوری خۆیان کۆکردەوە. دەیلەمییە دوورخراوەکان هەواڵی ئەمە دووانەیان بیست. دەیلەمییەکانیش پەیوەستیان بوون و مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەرجانیان کرد. سوپاییەکان لەدەوریان کۆبوونەوە و پەیوەستیان بوون. سەمسام ئەلدەولە سەرگەردان مایەوە و کەس نەیدەتوانی رێگە چارەیەك بدۆزێتەوە.

لەم کاتەدا ئوستاد هورموز لەفەسا مابوویەوە. یەکێك لەهاوەڵانی پێشنیاری پێکرد هەموو سامانی خۆی لەناو سوپاکەی بڵاو بکاتەوە و بڕواتە لای سەمسام ئەلدەولە و ئەو بەسوپاکەی لەئەهواز بگەیێنێت و ئەگەر ئەو کارەی نەکرد، بیترسێنێت. ئوستاد هورموز لەبەخشینی سامانەکەی رژدی کرد و سوپاییەکان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ماڵەکەیان تاڵان کرد و هەڵاتن. ئوستاد هورموز خۆی شاردەوە. ئەویان گرت و بردیانە لای دوو کوڕەکەی بەختیار و زیندانییان کرد. ئەو لەزیندان رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر و گیانی خۆی رزگار کرد.

هاوەڵانی سەمسام ئەلدەولە رێگەی قەڵایەکیان نیشاندا لەسەر دەروازەی شیراز بۆ

ئەوەی لەوێ پەنا بگرێت تا سوپاکەی ئەو کەسانەی پارێزگاری دەکەن، بگرن. سەمسام ئەلدەولە ویستی، لەقەلاکە بڕواتەسەر بەلام پاسەوانەکان ڕێگەیان لێگرت. سێسەد پیاوی هاوڕێی پێیان وت: باشتر وایە تۆ و دایکت بگرین و بتبەینە لای باوکی عەلی کوڕی ئوستاد هورموز. دەستەیەکی دیکە وتیان باشترە بڕۆینە لای کوردەکان و خۆمان بەهێز بکەین. ئەو ئەم کارەی کرد و لەگەڵ سامان و گەنجینەکانی خۆی لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت. سەربازەکانی خودی ئەو، ماڵ و سامانەکەیان تالان کرد و بڕیاریاندا ئەسیری بکەن بەلام بۆ دودمان هەلات.

دووری دودمان لەشیراز دوو مەنزڵ بوو.

باوکی نەسر کوڕی بەختیار لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و ڕێگەی شیرازی گرتەبەر. کارگوزاری دودمان بەناوی تاهیر، هێرشی کردە سەر سەمسام ئەلدەولە و گرتی. باوکی نەسر کوڕی بەختیار هاتە لای تاهیر و سەمسام ئەلدەولەی لێسەند و لەزیحەجە/ نۆڤەمبەر کوشتی. کاتێك سەری براوی سەمسام ئەلدەولەیان بردە لای باوکی نەسر، بەسەرە براوەکەی وت: ئەم نەریتە باوکی تۆ بەجێی هێشت. مەبەستی لەوتەکەی کوژرانی بەختیار بەدەستی عێزەد ئەلدەولە بوو.

سەمسام ئەلدەولە سی و پێنج ساڵ و حەوت مانگ ژیا و نۆ ساڵ و هەشت ڕۆژ فەرمانڕەوایەتی فارسی کرد. ئەو پیاوێکی بەخشەر و خۆڕاگر بوو. دایکی سەمسام ئەلدەولەیان بەیەکێك لەسەرکردە دەیلەمییەکان سپارد. ئەو دایکی سەمسام ئەلدەولەی کوشت و لەماڵەکەی بەخاکی سپارد. کاتێك بەها ئەلدەولە دەستی بەسەر فارسدا گرت، جەنازەی ئەوی هێنایەدەر و لەئارامگای بنەماڵەی بویە بەخاك سپێردرا.

## چۆنیەتی هەلاتنی کوڕی وەساب

لەم ساڵەدا باوکی عەبدوللە کوڕی جەعفەر، ناسراو بەکوڕی وەساب، لەزیندانەکەی لەکۆشکی خەلافەت هەلات.

ئەو پیاوە خزمێکی نزیکی خەلیفە تائیع بوو. کاتێك خەلیفە تائیع لەسەر کار لابرا، ئەو هەلات و ڕۆشتە لای موهەزیب ئەلدەولە. خەلیفە قادر کەسی بۆ گرتنی ئەو نارد بەلام موهەزیب ئەلدەولە ڕێگەی هەلاتنی بۆ کردەوە و باوکی عەبدوللە

ڕۆشتە مەدائین. خەلیفە قادر هەواڵی ئەوی پێگەیشت. ئەوی گرت و زیندانی کرد تا ئەوەی لەم ساڵەدا مرد و ڕۆشتە گیلان و بانگەشەی ئەوەی کرد کەخەلیفە تائیعە و ئەوەی لەخەلافەت دەیزانی، باسی کرد. محەممەد کوڕی عەباس، فەرمانڕەوای گیلان کچەکەی خۆی پێدا و هەموانی بۆ پەیوەست بوون بەو هاندا و خەڵکانی سەرزەمینەکانی نزیك ملکەچییان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا و بەو شێوەی نەریتیان بوو، سامانی خۆیان خستە بەردەست.

دەستەیەك لەوان- گیلانییەکان- ڕۆشتنە ماڵی خوا. خەلیفە قادر ئەوانی بۆ لای خۆی بانگ کرد و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری کردنەوە و لەمبارەوە نامەیەکی بەپێنووسی ئەوان نووسی بۆ ئەوەی سەرکۆنەیان بکات. خەڵکی گیلان لەکارەکانی خۆیان گوێیان لەوتاری قازی باوکی قاس کوڕی گوێ گوێ خوار دەگرت. لەمبارەوە نامەیەك لەبەغداد نووسرا و بارودۆخی گیلانییەکان ئاشکرا بوو. ئەوان باوکی عەبدوللەیان لەخۆیان دوور کردەوە.

## بیرکردنەوەی چەند ڕووداوێك

لەم ساڵەدا بەدر کوڕی حەسنەوییە پێگەی بەرز بوویەوە و لەلایەن دیوانی خەلیفەوە، نازناوی ناسر ئەلدین و ئەلدەولەی پێبڕا. ئەو لەمەککە و مەدینە خێری زۆری دەکرد و لەڕێگەی مەککە پارەیەکی زۆری بۆ عەرەبەکان خەرج دەکرد تا دەست لەئازاری حاجییەکان هەڵبگرن. ڕێگەی نەدەدا هاوەڵانی خۆی خراپەکاری و دزی بکەن. پێگەی بەرز بوویەوە و ناوی کەوتە ناو ناوان.

لەم ساڵەدا بۆ وەزارەتی واست باوکی عەلی کوڕی باوکی رەییان دەستنیشان کرا.

لەم ساڵەدا باوکی قاسم عەبدعەزیز کوڕی یوسفی جەکار مرد.

عزالدين ابن أثير

# الكامل في التأريخ

التر جمة

ظاهر محمد رشيد

المراجعة

بروفيسور المساعد د.ياسين سەردەشتى



نرخ ٧٥٠٠ دينار

دەزگاکانی خانی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا